رانستگا)؛ باوەڕپێکردن؛ بایەخ پێدان.

**accrete** (ə-krēt′), *v.i.* (١) زیادبوون؛ زیادکردن؛ زۆربوون.
(٢) کۆبوونەوە؛ کۆمەڵ بوون؛ هاتنەوەیەك؛ بوون بە یەك؛ پێکەوەنووسان.

**accretion** (ə-krē′shən), *n.* (١) زۆربوون؛ زیادبوون؛ زیادکردن.
(٢) هاتنەوەیەك؛ کۆمەڵ بوون. (٣) کۆمەڵ؛ تۆپەڵ.

**accrual** (ə-kroo′əl), *n.* (١) زیادبوون یا زیادکردن.
(٢) قازانج؛ سوود؛ ئەو هەندەی کە زیاد ئەکات.

**accrue** (ə-kroo′), *v.i.* (١) چوونەسەر؛ زیادبوون؛ زیادکردن.
(٢) قازانج کردن؛ سوود چوونەسەر.

-accruement *(n.).*

**acculturation** (ə-kul′chēr-ā′shən), *n.* (١) فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵ بە ژیانی ناو کۆمەڵ. (٢) ڕاهێنان یا ڕاهاتن بە ژینگە یا دەورووبەرێکی تازە.
(٣) گۆڕینی کلتوورێکی سەرەتایی بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ کلتوورێکی- پێشکەوتوودا

**accumulate** (ə-kūm′yoo-lāt′), *v.t.* کۆکردنەوە؛ کۆمەڵ کردن؛ کەڵەکەکردن؛ بارست کردن.
*v.i.* کۆمەڵ یا کەڵەکە بوون؛ بارست بوون؛ کۆبوونەوە.

-accumulative *(adj.).*

**accumulation** (ə-kūm′yoo-lā′shən), *n.* (١) کۆکردنەوە؛ کۆمەڵ یا کەڵەکە کردن؛ کۆبوونەوە؛ کۆمەڵ یا کەڵەکە بوون. (٢) کۆمەڵ؛ کەڵەکە.
(٣) قازانج خستنەسەر سەرمایە؛ قازانج چوونەسەر سەرمایە.

**accumulator** (ə-kūm′yoo-lā′tēr), *n.* (١) کۆکەرەوە؛ کەڵەکەکەر
(٢) باتری.

**accuracy** (ak′yoo-rə-si), *n.* تەواوی؛ بێ هەڵەیی؛ ووردی؛ ڕاستی

**accurate** (ak′yoo-rit), *adj.* تەواو؛ بێ هەڵە؛ ڕاست؛ وورد.

**accurately** (ak′yoo-rit′li), *adv.* بەتەواوی؛ بەبێ هەڵە؛ بەووردی؛ بەڕاستی.

**accursed** (ə-kūr′sid, ə-kūrst′), *adj.* بەلەعنەت؛ بەد؛ خواگرتوو.

**accurst** (ə-kūrst′), *adj.* = accursed.

**accusal** (ə-kūz′'l), *n.* = accusation.

**accusation** (ak′yoo-zā′shən), *n.* تاوانبارکردن؛ گوناهبارکردن.

**accusative case,** باری کارلێکراو یا کار کەوتەسەر (ڕێزمان):
( me, us, him, her, them, whom )

**accusatory** (ə-kū′zə-tôr′i, ə-kū′zə-tō′ri), *adj.* تاوانبارکەر؛ گوناهبارکەر.

**accuse** (ə-kūz′), *v.t.* تاوانبارکردن؛ گوناهبارکردن؛ گومانبارکردن.

-accuser *(n.).*

**accused** (ə-kūzd′), *n. sing. & pl.* تاوانبارکراو؛ گوناهبارکراو.
هەمیشە بەشێوەی " the accused " بەکاردەهێنرێت).

**accustom** (ə-kus′təm), *v.t.* ڕاهێنان؛ ڕاهاتن؛ فێرکردن.

**accustomed** (ə-kus′təmd), *adj.* (١) ڕاهاتوو؛ خوو پێوەگرتوو؛ فێر؛ هۆگر. (٢) ئاسایی.

**ace** (ās), *n.* (١) ئاس (کاغەزی قومار)؛ یەك خاڵ (دۆمینە).
(٢) سێرڤی زۆر بەهێزی نەگەڕێنراوە (یاری تەنس).
(٣) پسپۆڕ؛ کەسێکی شارەزاو لێهاتوو.
(٤) نەخت؛ تۆزقاڵ: *( I was within an ~ of confessing.)* .
*adj.* [Colloq.], نایاب؛ زۆرباش؛ لێهاتوو؛ شارەزا: *( an ~ salesman)* .
*v.t.* سێرڤی نەگەڕێنراوە لێدان و خاڵ گرتن (یاری تەنس).

**within an ace of,** ئەوەندەی تاڵەموویەکی مابوو کە؛ نەختێکی مابوو کە.

**acerbate** (as′ēr-bāt′), *v.t.* (١) تاڵ یا ترش کردن. (٢) پەستکردن.

**acerbity** (ə-sūr′bə-ti), *n.* (١) ترشی؛ تاڵی.
(٢) قسەڕەقی؛ زمان تیژی؛ دەم پیسی.

**acetic** (ə-sē′tik, ə-set′ik), *adj.* سرکەیی.

**acetic acid,** ترشی سرکە؛ ترشی ئەسیتیك.

**acetone** (as′ə-tōn′), *n.* ئەسیتۆن: شلەیەکی بێ ڕەنگی زوو گڕگرە (کیمیا).

**acetous** (as′ə-təs, ə-sē′təs), *adj. Also* acetose, ترش.

**acetum** (ə-sē′təm), *n.* سرکە.

**acetyl** (as′ə-til), *n.* ئەسیتیل: شلەیەکی بێ ڕەنگە (کیمیا).

**acetylene** (ə-set′'l-ēn′), *n.* ئەسیتیلین: گازێکی بێ ڕەنگە لە لەحیم- کاریدا بەکاردەهێنرێت (کیمیا).

**ache** (āk), *v.i.* (١) ئێشان؛ ئازاربوون؛ ژان کردن؛ گل کردن.
(٢) [Colloq.]، بۆ پەرێشان بوون؛ بۆ بەپەرۆشەوە بوون؛ زۆر حەزلێکردن.
*n.* ئێش؛ ئازار؛ ژان؛ ئاسۆر؛ سوێ.

**achievable** (ə-chēv′ə-b'l), *adj.* دەتوانرێت بهێنرێتەدی؛ بەبەرهەم دەهێنرێت؛ دەهێنرێتە دی؛ دەستگیر ئەبێ.

**achieve** (ə-chēv′), *v.t.* هێنانەدی؛ هێنانە بەرهەم؛ دەسکەوتن؛ کردن؛ بەدەستهێنان؛ دەستگیرکردن؛ ئەنجامدان.
*v.i.* سەرکەوتن؛ بە ئەنجام گەیاندن.

**achievement** (ə-chēv′mənt), *n.* (١) بەرهەم؛ دەسکەوت.
(٢) ئیشێك یا کارێك کە شارەزایی و لێهاتوویی پێویست بێت.

**achievement quotient,** ڕێژەی نێوان تەمەنی کەسێك و پلەی فێربوونی یا قوتابخانەی.

**Achilles' heel,** خاڵی لاوازی مرۆڤێك؛ شوێنی زەفەر پێ بردنی کەسێك.

**achromatic** (ak′rə-mat′ik), *adj.* (١) بێ ڕەنگ.
(٢) ڕوون؛ ڕووناك.

**achromatism** (ə-krō′mə-tiz'm), *n.* بێ ڕەنگی.

**acid** (as′id), *adj.* ترش؛ مزر.
*n.* تێزاب؛ ترش؛ شتێکی ترش؛ ترشەڵۆك.

**acidic** (ə-sid′ik), *adj.* (١) ترش؛ مزر. (٢) تێزابی.

**acidity** (ə-sid′ə-ti), *n.* ترشی؛ مزری.

**acid test,** سەنگی مەحەك.

**acknowledge** (ək-nol′ij, ak-nol′ij), *v.t.* (١) دان پیانان؛ پێ لێنان؛ چوونە ژێر. (٢) سوپاس کردن.
(٣) دان بە وەرگرتندا نان و وەڵامدانەوە: *( to ~ a letter)* .
(٤) بە ڕاستەقینە دانان (یاساگەری): *( to ~ a deed)*

**acknowledged** (ək-nol′ijd, ak-nol′ijd), *adj.* دان پیانراو:
*( the ~ leader of the movement)*

**acknowledgement** (ək-nol′ij-mənt, ak-nol′ij-mənt), *n.*
(١) دان پیانان؛ پێ لێنان؛ چوونە ژێر. (٢) وەڵامدانەوە (نامە، سڵاو .. هتد).
(٣) سوپاسنامە. (٤) چاکەدانەوە؛ شتێ چاکە پێ دانەوە.
(٥) بڕوانامە (یاساگەری).

**acme** (ak′mi, ak′mē), *n.* بەرزترین پلە؛ پۆپ؛ ئەوپەڕ (توانا، ئاوات، باشی... هتد)؛ تاف.

**acne** (ak′ni, ak′nē), *n.* عازەبە؛ زیپکەی دەموچاوی هەرزەکار.

**aconite** (ak′ə-nīt′), *n.* (١) wolfsbane .
(٢) دەرمانێکە لە ڕەگی ووشك کراوەی ئەم ڕووەکە درووست دەکرێت.

**acorn** (ā′kôrn, ā′kērn), *n.* بەڕوو.

**acorn cup,** جەوت؛ کڵاوی بەڕوو.

**acoustic** (ə-koos′tik, ə-kous′tik), *adj.* تایبەتی بە بیستن، دەنگی بیستراو.

-acoustically *(adv.).*

**acoustics** (ə-koos′tiks, ə-kous′tiks), *n.pl.* (١) باری بیستنی دەنگ (لە هۆڵێك یا شانۆیەکدا... هتد)؛ چۆنیەتی دەنگ لە شوێنێکی وەهادا (لەڕووی باشی و خراپی بیستنەوە). (٢) (*sing.*)، زانستی دەنگ؛ دەنگناسی.

**acquaint** (ə-kwānt′), *v.t.* (١) ( ~ with )، خۆ پێ ڕاهێنان؛ خۆ فێرکردن؛ فێربوون؛ شارەزاکردن؛ پێناسین؛ زانین.
(٢) ( ~ with )، پێ وتن؛ ئاگادارکردن.

**acquaintance** (ə-kwān′t'ns), *n.* (١) شارەزایی؛ زانین.

(٢) ناسیاوی؛ ناسین؛ ناشنایەتی. (٣) ناسیاو؛ ناشنا.
**acquaintanceship** (ɔ-kwān′t'ns-ship′), ***n.*** (١) شارەزایی؛
لێ زانین؛ زانین. (٢) ناسیاوی؛ ناسین؛ ناشنایەتی.
**acquainted** (ə-kwān′tid), ***adj.*** (١) شارەزا؛ بزان.
(٢) ناسیاو؛ ناشنا؛ ناسیاون؛ ناشنان.
**acquiesce** (ak′wi-es′), ***v.i.*** پەسەندکردن؛ قایل بوون؛ ڕازی بوون.
**acquiescence** (ak′wi-es′'ns), ***n.*** پەسەندی؛ پەسەندکردن؛ قایلی؛
قایل بوون؛ ڕەزامەندی.
**acquiescent** (ak′wi-es′'nt), ***adj.*** ڕەزامەند؛ قایل؛ پەسەندکەر.
**acquirable** (ə-kwīr′ə-b'l), ***adj.*** (١) دەست دەکەوێ؛ پەیدا دەکرێ.
(٢) مرۆڤ بۆی هەیە فێری ببێت.
**acquire** (ə-kwīr′), ***v.t.*** (١) چنگ کەوتن؛ پەیداکردن؛ کڕین:
*( The library has ~d many books in the last two months.)*
(٢) (ا) فێربوون؛ دەست کەوتن: ***( to ~ knowledge)*** .
(ب) فێربوون: ***( to ~ new habits)*** .
**acquired** (ə-kwīrd′), ***adj.*** (١) دەست کەوتوو.
(٢) فێربوو؛ وەرگیراو؛ نازگماکی: ***( an ~ habit)*** .
**acquirement** (ə-kwīr′mənt), ***n.*** (١) شتێکی دەست کەوتوو؛
دەست کەوتوو. (٢) شتێك یا کارسازییەکی فێربوو (ئۆتۆمبیل لێخوڕین،
چاپکردن... هتد).
**acquisition** (ak′wə-zish′ən), ***n.*** (١) دەست کەوتن؛ چنگ کەوتن؛
کڕین (٢) دەست کەوتوو؛ دەسکەوت؛ شتی دەست کەوتوو.
**acquisitive** (ə-kwiz′ə-tiv), ***adj.*** چاوبرسی؛ کنێوەکەر؛ چاوچنۆك؛
حەزکەر لە دەست کەوتن و کۆکردنەوەی شتومەك.
**acquit** (ə-kwit′), ***v.t.*** ئازادکردن یا سەرفرازکردنی گومانبار لەلایەن
دادگاوە؛ بەرەڵاکردن لەبەر بێ تاوانی.
**acquittal** (ə-kwit′'l), ***n.*** سەرفرازکردن یا ئازادکردنی گومانبار لەلایەن
دادگاوە؛ بەرەڵاکردن لەبەر بێ تاوانی؛ سەرفرازی.
**acquittance** (ə-kwit′'ns), ***n.*** (١) ئازادکردن (لە قەرزاری یا
بەرپرسیاری)؛ بەخشین. (٢) قەرز وەرگرتنەوە.
**acre** (ā′kēr), ***n.*** ئەیکەر: پێوانەیەکە بۆ پێوانی ڕووبەری زەوی کە بریتییە
لە (٤٣٥٦٠) مەترە دووجا.
**acreage** (ā′kēr-ij, ā′krij), ***n.*** سەرجەمی ڕووبەری زەوی بە ئەیکەر.
**acrid** (ak′rid), ***adj.*** (١) تیژ؛ تاڵ؛ ترش؛ تفت.
(٢) بۆسۆ (جل، پەڕ... هتد). (٣) بڕ؛ تیژ (ووتە، توانج... هتد).
**acridity** (a-krid′ə-ti, ə-krid′ə-ti), ***n.*** (١) تیژی؛ ترشی؛ بۆسۆ.
(٢) (*pl.*)، ووتەیەك یا توانجێکی ڕەق و توندوتیژ.
**acrimonious** (ak′rə-mō′ni-əs), ***adj.*** قیناوی؛ بڕ (ووتە)؛
توندوتیژ (ووتە، کردار).
**acrimony** (ak′rə-mō′ni), ***n.*** کینە؛ قین؛ کینەداری و ناحەزی؛
توندوتیژی (ووتە، کردار).
**acrobat** (ak′rə-bat′), ***n.*** تەنافباز.
**acrobatic** (ak′rə-bat′ik), ***adj.*** تایبەتی بە تەنافبازی.
**-acrobatically** ***(adv.)***.
**acrobatics** (ak′rə-bat′iks), ***n.pl.*** تەنافبازی.
**acronym** (ak′rə-nim), ***n.*** کورتەی چەند ووشەیەکە لە تیپی یەکەمی
ووشەکان پێکدێت:
*( "RADAR" is an ~ for radio detecting and ranging.)*
**acropolis** (ə-krop′ə-lis), ***n.*** (١) بەرزترین قەڵای شارێکی یۆنانی.
(٢) [A-]، قەڵای هەرەبەرزی شاری " ئەسینا " ی پایتەختی یۆنان.
**across** (ə-krôs′, ɔ-kros′), ***adv. & prep.*** (١) بەسەر؛ لەسەر؛
لەم بەرەوە بۆ ئەوبەر؛ پێیدا. (٢) ئەوبەر؛ لەوبەرەوە؛ بەرامبەر.
(٣) بە لێکدراوی؛ چەپ و ڕاست.
(٤) تووش هاتن: ***( He came ~ an old friend.)*** .
**across the board,** گشتی؛ هەموو؛ هەمووی دەگرێتەوە.
**come (run) across,** تووش بوون؛ بە ڕێکەوت دۆزینەوە؛ بینین:
***( to come across a good book)***
**go across,** پەڕینەوە؛ پێدا ڕۆیشتن؛ پێدا تێپەڕبوون.
**act** (akt), ***n.*** (١) کار؛ کردە؛ ئیش؛ کردەوە؛ کردار.
(٢) [A-]، یاسا؛ فەرمان؛ یاسانامە. (٣) پەردە (شانۆگەری)؛ بەش.
(٤) [Colloq.]، خۆنوواندنی درۆ: ***( It is just an ~ .)*** .
***v.t.*** (١) نوواندن (شانۆ).
(٢) ڕەووشت نوواندن؛ لاسایی کردنەوە: ***( to ~ the child)*** .
***v.i.*** (١) نوواندن (شانۆ). (٢) شیان بۆ خستنەسەر شانۆ.
(٣) کردن؛ پێ هەڵسان. (٤) ڕەووشت نوواندن؛ ڕەفتارکردن.
(٥) کارتێکردن.
(٦) وا دەرخستن؛ وا نوواندن: ***( He ~ed very angry.)*** .
**act as,** هەڵسان بە.
**act for,** جێگری کردن؛ هەڵسان بە کارێك لەباتی کەسێك.
**act on,** (١) پەیڕەوی کردن.
(٢) خستنەکارو بڕیار لەسەردان (مەسەلە، گەڵاڵەی یاسا).
(٣) کارتێکردن.
**act up,** [Colloq.], (١) بزێوی کردن؛ ئەسرەوتن.
(٢) بەدڕەفتاری نوواندن.
**in the act of,** گیران بە تاوانەوە:
***( The thief was cought in the act of taking the money.)***
**put on an act,** خۆنوواندن بە درۆ؛ بە درۆ وا دەرخستن.
**acting** (ak′tiŋ), ***adj.*** جێگر؛ جێنشین: ***( the ~ chairman)*** .
***n.*** (١) نوواندن (شانۆ)؛ پیشەی ئەکتەر.
(٢) کردەوە یا ڕەفتاری درۆزنانە.
**action** (ak′shən), ***n.*** (١) کردار؛ کار؛ کردە؛ کردەوە.
(٢) (*pl.*)، ڕەووشت؛ ڕەفتار. (٣) شێوەی گەڕان (مەکینە).
(٤) ڕووداوی چیرۆکێك یا شانۆگەرییەك.
(٥) داوا (دادگا). (٦) جەنگ؛ شەڕ.
**bring action,** شکات کردن؛ دان بە دادگا.
**in action,** (١) لە کاردا؛ لە گەڕدا؛ لە ئیشکردندا.
(٢) لە شەڕدا؛ لە جەنگدا.
**take action,** (١) پێ هەڵسان؛ بە کار هەڵسان؛ کردن.
(٢) شکات کردن؛ دان بە دادگا.
**activate** (ak′tə-vāt′), ***v.t.*** (١) خستنەکار؛ زیندووکردنەوە؛
خستنەگەڕ. (٢) دامەزراندن (دەزگای سەربازی یا میری).
(٣) پاکردنەوە (زێراب).
**-activation** ***(n.)***; **activator** ***(n.)***.
**active** (ak′tiv), ***adj.*** (١) بەکار؛ کاریگەر.
(٢) چالاك؛ گورج وگۆڵ؛ چاپك؛ کارا.
(٣) بزێو؛ جموجووڵکەر.
(٤) تایبەتی بە کرداری بەکار یا بکەر (ڕێزمان):
*( He writes a letter every day.)*
***n.*** کرداری بکەر یا بەکار (ڕێزمان) (ژمارە چوار ببینە).
**the active voice,** کرداری بکەر یا بەکار (ڕێزمان):
***( We punished him.; She ate an apple.; He plays football.)***
**active duty,** سەربازی کردن.
**active service,** لە سوپادا بوون لەکاتی جەنگدا؛ سەربازی کردن.
**activism** (ak′tiv-iz'm), ***n.*** چالاکی؛ خەبات؛ خەبات کردن.
**activist** (ak′tiv-ist), ***n.*** چالاك؛ خەباتکەر.
**activity** (ak-tiv′ə-ti), ***n.*** (١) کردەوە؛ کردار؛ کردە؛ کار.
(٢) جموجووڵ؛ هەڵسوکەوت. (٣) چالاکی؛ گورج وگۆڵی.
(٤) چالاکییەکی تایبەتی: ***( outside ~ies)*** .
**act of God,** کاری خودا؛ ئیشی خواکرد؛ خواکرد.
**act of war,** کاری دوژمنانە لەنێوان وولاتاندا؛ کردەوەی جەنگاوەرانە.

**actor** (ak′tēr), *n.* ئەکتەر (شانۆگەری، فیلم)؛ نوێنەر.
**actress** (ak′tris), *n.* ئەکتەری ژن (شانۆگەری)؛ نوێنەری ژن.
**actual** (ak′choo͞-əl), *adj.* ڕاستەقینە؛ ڕاست.
**actuality** (ak′choo͞-al′ə-ti), *n.* (١) ڕاستی؛ ڕاستێتی. (٢) شتێکی ڕاست؛ بارێکی ڕاستەقینە.
**in actuality,** لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی.
**actualize** (ak′choo͞-əl-īz′), *v.t.* هێنانەدی.
**-actualization** *(n.).*
**actually** (ak′choo͞-əl-i, ak′choo-li), *adv.* لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی؛ ئەوی ڕاست بێت.
**actuary** (ak′choo͞-er′i), *n.* ژمێریاری کۆمپانیای بیمە؛ بیمەزان.
**actuate** (ak′choo͞-āt′), *v.t.* (١) خستنەگەڕ؛ خستنە ئیش؛ بزواندن. (٢) هاندان؛ جوولاندن؛ پاڵ پێوەنان.
**-actuation** *(n.).*
**acuity** (ə-kū′ə-ti), *n.* بیرتیژی؛ وریایی؛ دانایی؛ زیرەکی.
**acumen** (ə-kū′mən), *n.* زیرەکی؛ دانایی؛ بیرتیژی؛ چاوتیژی.
**acupuncture** (ak′yoo-puŋk′chēr), *n.* دەرزی ئاژنینی نەخۆش (پزیشکەوانی چینی).
**acute** (ə-kūt′), *adj.* (١) تیژ. (٢) زیرەک؛ وریا. (٣) توندوتیژ؛ زۆر (ئازار، ناخۆشی، دڵ پیسی... هتد). (٤) گرنگ. (٥) بەرزو تیژ (دەنگ). (٦) گۆشەی تیژ؛ گۆشەی لە (٩٠ پلە) کەمتر *( an ~ angle)* .
**-acutely** *(adv.)*; acuteness *(n.).*
**A.D.,** ساڵی زایینی؛ زایینی؛ ساڵی فەرەنگی؛ پاش زایین (پ.ز).
**adage** (ad′ij), *n.* پەندی پێشینان؛ قسەی ئەستەق.
**Adam** (ad′əm), *n.* ئادەم
**not know (a person) from Adam,** نەناسین بە هیچ جۆرێك
**Adam's apple,** قوڕتم
**adamant** (ad′ə-mant′, ad′ə-mənt), *n.* (١) بەردێکی سەخت؛ ئەڵماس. (٢) شتێکی ڕەق یا سەخت.
*adj.* زۆر ڕەق؛ سەخت؛ سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ قیرسچمە؛ سوور لەسەر.
**adamantine** (ad′ə-man′tin), *adj.* (١) ئەڵماس. (٢) سەخت؛ زۆر ڕەق؛ سەرسەخت؛ قیرسچمە؛ کەللەڕەق؛ سوور لەسەر.
**adapt** (ə-dapt′), *v.t.* ڕاهێنان؛ گونجاندن؛ سازاندن.
*v.i.* ڕاهاتن؛ گونجان؛ سازان.
**adaptability** (ə-dap′tə-bil′ə-ti), *n.* توانای ڕاهاتن یا گونجان بوون؛ سازان.
**adaptable** (ə-dap′tə-b'l), *adj.* ڕادەهێنرێت؛ دەگونجێت؛ گونجاو.
**adaptation** (ad′əp-tā′shən, ad′ap-tā′shən), *n.* (١) ڕاهاتن؛ ڕاهێنان؛ گونجان؛ سازان. (٢) گۆڕین یا گۆڕانی زیندەوەر بۆ گونجان لەگەڵ دەوروبەریدا؛ ڕاهاتنی زیندەوەر بە دەوروبەری تازە. (٣) ئەنجامی گۆڕین: *( This play is an ~ from a novel.)* . (٤) گۆڕینی خوو ڕەووشت بۆ گونجان لەگەڵ دەوروبەری تازەدا.
**adapter** (ə-dap′tēr), *n.* (١) ڕاهاتوو (مرۆڤ، شت)؛ گونجاو؛ سازاو. (٢) گونجێنەر (ئامێر). (٣) ئامێری پەیوەست.
**add** (ad), *v.t.* (١) کۆکردنەوە (ژمارە)؛ خستنەسەر. (٢) دانە دەم؛ خستنەسەر؛ پێوەنان. (٣) زیادە لەوەش ووتن؛ هەروەها ووتن.
*v.i.* (١) ( ~ to )، زیاترکردن: *( This ~s to my pleasure.)* . (٢) کۆکردنەوە (ژمارە).
**add up,** کۆکردنەوە (ژمارە)؛ خستنەسەر
**add up to,** (١) کردنە ئەوەندە. (٢) وا گەیاندن؛ بریتی بوون لە.
**addend** (ad′end, ə-dend′), *n.* ژمارەی کۆکراوە یا خراوەسەر.
**addendum** (ə-den′dəm), *n.* (١) شتی خراوەسەر. (٢) پاشکۆ (پەڕتووك، گۆڤار... هتد).
**adder** (ad′ēr), *n.* مار.

**addict** (ə-dikt′), *v.t.* ( ~ to ), خوو پێوەگرتن (تلیاك، جگەرە... هتد)؛ هۆگربوونی شتێك.
*n.* خووپێوەگر؛ هۆگر؛ فێر.
**addicted** (ə-dik′tid), *adj.* ( ~ to ), خووپێوەگرتوو (شتێکی خراپ)؛ هۆگر؛ فێر.
**addiction** (ə-dik′shən), *n.* خووپێوەگرتن (تلیاك، مەی، جگەرە، چا، قاوە... هتد)؛ خوو؛ هۆگری.
**adding machine,** مەکینەی کۆکەرەوە؛ ئامێری ژماردن.
**addition** (ə-dish′ən), *n.* (١) کۆکردنەوە (بیرکاری)؛ خستنەسەر. (٢) پێکەوەنووساندن یا بەستن؛ خستنەپاڵ؛ دانەدەم. (٣) زیادە؛ شتی خراوەسەر.
**in addition to,** سەرەڕای؛ سەرباری؛ زیاد لەوە.
**additional** (ə-dish′ən-'l), *adj.* هی تر؛ هی کە؛ زیادە؛ سەربار.
**addle** (ad′'l), *adj.* (١) پیس (هێلکە). (٢) بۆش (مێشك)؛ بەتاڵ؛ شێواو؛ لێڵ: *( ~ - brained)*
*v.t.* (١) پیس کردن. (٢) شێواندن.
*v.i.* (١) پیس بوون. (٢) شێوان.
**address** (ə-dres′), *v.t.* (١) بانگ کردن: *( A~ the judge as "Your Honor" .)* (٢) قسە بۆ کردن؛ نامە بۆ نووسین؛ لەگەڵ دووان؛ ووتاردان (٣) ناونیشان لەسەر نووسین: *( to ~ a letter)* . (٤) ( to ~ )، ئاراستەکردن (ووتە). (٥) لێدووان بە ڕاستەوخۆ: *( to ~ the issue)* .
*n.* (١) بانگ؛ ووتار. (٢) ناونیشان.
**addressee** (ad′res-ē′), *n.* بۆ نێردراو (نامە، پۆستە، بارگە)؛ نامە بۆ نووسراو.
**addresser** (ə-dres′ēr), *n.* نێرەر (نامە، پۆستە، بارگە)؛ پۆستەنێر.
**addressor** (ə-dres′ēr), *n.* = addresser.
**adduce** (ə-do͞os′, ə-dūs′), *v.t.* بەڵگە هێنانەوە؛ نموونە هێنانەوە.
**adduct** (ə-dukt′), *v.t.* ڕاکێشانی ئەندامی لەش بەرەو ئەندامێکی تر.
**-adduction** *(n.).*
**aden-** (ad′'n), *Also* adeno-, پێشگرێکە بەمانای: لوو.
**adenoid** (ad′'n-oid′), *adj.* وەك لوو؛ لوویی؛ لوو.
**adenoids** (ad′'n-oidz′), *n.pl.* زیادە گۆشتی سەرووی قوڕگ لەپشت لووتەوە کە دەبێتە هۆی تەنگەهەناسەیی.
**adenology** (ad′'n-ol′ə-ji), *n.* زانستی لوو؛ لووزانی.
**adenoma** (ad′'n-ō′mə), *n.* زیادە گۆشتی لوویی؛ ئاوساوی یا برینی وەك لوو.
**adept** (ə-dept′), *adj.* شارەزا؛ کارامە؛ بەتوانا؛ لێهاتوو؛ سەردەرچوو.
**adequacy** (ad′ə-kwə-si), *n.* بەس بوون؛ نە کەمی و نە زۆری؛ بێ زیادو کەمی؛ سەروبەری.
**adequate** (ad′ə-kwit), *adj.* بەس؛ نە کەمو نە زۆر؛ بێ زیادو کەم.
**adhere** (əd-hêr′, ad-hêr′), *v.i.* (١) پێوەلکان؛ پەیوەست بوون. (٢) ( to ~ )، پەیڕەوی کردن؛ لەسەر ڕۆیشتن؛ پاڵپشتی کردن: *( to ~ to tradition, the law, certain ideas, etc.)*
**adherence** (əd-hêr′əns, ad-hêr′əns), *n.* لەسەر ڕۆیشتن؛ خۆ پێوەبەستن؛ لایەن گرتن: *( ~ to a person, a cause, a principle, or an idea)*
**adherent** (əd-hêr′ənt, ad-hêr′ənt), *adj.* پێوەنووساو؛ پێوەلکاو.
*n.* پەیڕەویکەر (ڕێباز، بیروباوەڕ، حیزب)؛ لایەنگر.
**adhesion** (əd-hē′zhən, ad-hē′zhən), *n.* (١) پێوەنووسان؛ پێوەلکان. (٢) پەیڕەوی کردن؛ لایەن گرتن. (٣) گۆشتەزوون هێنانەوە. (٤) هێزی پێکەوەنووسێنەر (فیزیا).
**adhesive** (əd-hē′siv, ad-hē′siv), *adj.* بە ئاسانی پێوەی دەلکێت؛

سرنشاوی: ***( an ~ material)*** .

***n.*** شتێکی بە ئاسانی پێوەلکاو؛ شتێکی سرنشاوی.

**adhesive tape,** شریتی پێوەلکێنەر؛ شریتی سرنشاوی.

**adieu** (ə-dū′, ə-dōō′), ***interj. & n.*** خوات لەگەڵ؛ خواحافیز.

**adjacency** (ə-jā′s'n-si), ***n.*** نزیکی (شوێن)؛ هاوسنووری.

**adjacent** (ə-jā′s'nt), ***adj.*** نزیک؛ هاوسنوور؛ بەتەنیشت:

***( The houses are ~ to each other.)***

**adjacent angles,** دوو گۆشەی هاوسنوور (ئەندازە)

**adjectival** (aj′ik-tī′v'l, aj′ik-ti-v'l), ***adj.*** ئاوەڵناوی

**adjective** (aj′ik-tiv), ***n.*** ئاوەڵناو

**adjoin** (ə-join′), ***v.t.*** (١) هاوسنووربوون؛ بەتەنیشتەوەبوون.
(٢) پێکەوەنووساندن؛ لێکدان؛ کردن بە یەك.

***v.i.*** هاوسنووربوون؛ بەتەنیشتەوەبوون.

**adjoining** (ə-join′iŋ), ***adj.*** هاوسنوور؛ بەتەنیشت؛ نزیك:

***( the ~ house, property, etc.)***

**adjourn** (ə-jûrn′), ***v.t.*** کۆتایی پێ هێنان (کۆڕ، کۆبوونەوە، دادگا)؛
هەڵسان ***( The chairman ~ed the meeting.)*** .

***v.i.*** (١) هەڵسان (کۆڕ، کۆبوونەوە، دادگا)؛ کۆتایی هاتن:

***( The meeting will ~ . ; The court ~ed.)***

(٢) [Colloq.]، چوون؛ ڕۆیشتن (بۆ شوێنێکی نزیك یا تەنیشت):

***( Let's ~ to the living room.)***

**adjournment** (ə-jûrn′mənt), ***n.*** (١) کۆتایی پێ هێنان (کۆڕ،
کۆبوونەوە، دادگا)؛ کۆتایی؛ هەڵسان. (٢) کاتی پشوو (دادگا، پەرلەمان).

**adjudge** (ə-juj′), ***v.t.*** (١) دادگەری کردن؛ بڕیاردان بەپێی یاسا.
(٢) ( to ~ )، سزا بەسەردا دان. (٣) پێدان بەپێی یاسا؛ بۆ بڕاردن.
(٤) [Rare]، وا دانان.

**adjudicate** (ə-jōō′di-kāt′), ***v.t.*** = adjudge.

***v.i.* ( ~ in ; ~ on ),** دادپرسی کردن؛ بڕیاردان بەپێی یاسا.

**-adjucation *(n.).***

**adjudicator** (ə-jōō′di-kā′tēr), ***n.*** دادگەر؛ دادپرس.

**adjunct** (aj′uŋkt), ***n.*** (١) پاشکۆ؛ کلك؛ ناسەرەکی.
(٢) یاریدەدەر؛ یارمەتیدەر. (٣) ئاوەڵناو؛ ئاوەڵکردار (ڕێزمان).
(٤) تایبەخۆیەکی ناگرنگ.

**-adjunctive *(adj.).***

**adjure** (ə-joor′), ***v.t.*** (١) سوێنددان.
(٢) داوالێکردن؛ تکالێکردن؛ لێ پاڕانەوە.

**-adjuration *(n.)*; adjurer, adjuror *(n.).***

**adjust** (ə-just′), ***v.t.*** (١) چاککردن؛ ڕێك کردن؛ گونجاندن؛ تاوتووکردن.
(٢) ڕاستکردنەوە (کاتژمێر): ***( to ~ a watch)*** .
(٣) بڕینەوەی بڕاردن (بیمە).
(٤) چاککردن (نیشانی تفەنگ و دەمانچە).

***v.i.*** ڕاهاتن؛ گونجان؛ شیان؛ سازان

**adjustable** (ə-jus′tə-b'l), ***adj.*** چاك دەکرێت؛ ڕاست دەکرێتەوە؛
ڕێك دەکرێت؛ دەگونجێنرێت.

**adjuster, adjustor** (ə-jus′tēr), ***n.*** (١) چاککەرەوە (شت، ئامێر)؛
ڕاستکەرەوە؛ گونجێنەر. (٢) بڕیاردەری بڕاردن (بیمە).

**adjustment** (ə-just′mənt), ***n.*** (١) چاککردن؛ ڕێك کردن؛ گونجان؛
گۆڕین. (٢) هۆی چاککردن (ئامێر). (٣) ڕێکەوتن (بڕاردن، داوا، ماف).
(٤) نرخ داشکاندن.

**adjutant** (aj′ə-tənt), ***n.*** (١) یاریدەدەر
(٢) یاوەر؛ یاریدەدەری سەرلەشکری ناوچە.
(٣) حاجی لەقلەقێکی گەورەی ئەفەریقایییە.

**adjutant general,** (١) سەرگەورەی یاریدەدەرانی سەرلەشکری ناوچە.
(٢) سەرۆکی سوپای میللی ویلایەتێکی ئەمەریکا.

**adjuvant** (aj′ə-vənt), ***adj.*** یاریدەدەر.

***n.*** (١) یاریدەدەر (مرۆڤ، شت). (٢) دەرمان بەهێزکەر.

**ad-lib** (ad′lib′), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.], بەسەرپێیییەوە ووتن؛
ووتن یا کردن بەبێ پەراوەو خۆ ئامادەکردن.

***n.*** شتی سەرپێیی (ووتە، مۆسیقا، کردار).

***adj.*** سەرپێیی؛ هەڕلەخۆوە؛ بەبێ پەراوەو خۆ ئامادەکردن.

**admeasure** (ad-mezh′ēr), ***v.t.*** دابەشکردن؛ بەشکردن؛
بەش بەش کردن.

**admeasurement** (ad-mezh′ēr-mənt), ***n.*** (١) پێوان.
(٢) قەبارە؛ کورتی و درێژی و پانی.
(٣) بەشکردن؛ دابەشکردن.

**administer** (ad-min′ə-stēr), ***v.t.*** (١) بەڕێوەبردن؛ هەڵسووڕاندن.
(٢) سزا بۆ بڕینەوە؛ سزادان: ***( to ~ punishment, justice, etc.)*** .
(٣) لێدان یا پێدان (دەرمان). (٤) سوێنددان.
(٥) سەروەسیەتی کردن؛ سەرپەرشتی کردنی وەسیەتنامە.

***v.i.*** (١) بەڕێوەبەری کردن؛ بوون بە بەڕێوەبەر؛ سەرپەرشتی کردن.
(٢) ( to ~ )، خزمەت کردن؛ ئاگاداری کردن؛ سەرەوکاری کردن:

***( to ~ to an invalid's needs)***

**-administrable *(adj.).***

**administrant** (ad-min′ə-strənt), ***n.*** بەڕێوەبەر؛ کارگێڕ.

**administrate** (ad-min′ə-strāt′), ***v.t.*** = **administer.**

**administration** (ad-min′ə-strā′shən), ***n.*** (١) بەڕێوەبەرێتی؛
کارگێڕی. (٢) بەڕێوەبردن؛ هەڵسووڕاندن.
(٣) [A-]، میری؛ لقی فەرمان یا جێبەجێکردنی میری.
(٤) لێدان یا پێدان (دەرمان)؛ سوێنددان.

**administrative** (ad-min′ə-strā′tiv), ***adj.*** بەڕێوەبەری؛
تایبەتی بە بەڕێوەبەری؛ کارگێڕی.

**administrator** (ad-min′ə-strā′tēr), ***n.*** (١) بەڕێوەبەر؛ کارگێڕ؛
سەرپەرشتیار. (٢) سەروەسیەت؛ میرات بەشکەر.

**admirable** (ad′mə-rə-b'l), ***adj.*** مایەی شانازییە؛ زۆر پەسەند؛
زۆرباش؛ نایاب.

**admirably** (ad′mə-rə-bli), ***adv.*** بەشێوەیەك کە مایەی شانازی
بێت؛ زۆر بە باشی و جوانی: ***( He behaved ~ .)*** .

**admiral** (ad′mə-rəl), ***n.*** ئەدمیراڵ: ئەفسەرێکی پلە بەرزی هێزی
دەریایی ئینگلتەرەو ئەمەریکایە.

**-admiralship *(n.).***

**admiralty** (ad′mə-rəl-ti), ***n.*** (١) پلەی ئەدمیراڵ؛ ئەدمیراڵێتی.
(٢) [A-]، وەزارەتی هێزی دەریایی ئینگلتەرە.
(٣) یاسای دەریایی.

**admiration** (ad′mə-rā′shən), ***n.*** (١) پەسەندکردن؛ بەدڵ بوون.
(٢) ڕێز.

**admire** (əd-mīr′), ***v.t.*** (١) پەسەندکردن؛ دڵ پیاچوون.
(٢) ڕێزلێگرتن؛ ڕێز بۆ بوون.

**admirer** (əd-mīr′ēr), ***n.*** پەسەندکەر؛ دڵ پیاچوو؛ ڕێزلێگر.

**admissible** (əd-mis′ə-b'l, ad-mis′ə-b'l), ***adj.*** (١) ڕێگەدراو؛
هێڵراو. (٢) مافی وەرگرتنی هەیە؛ بۆی هەیە وەربگیرێت.

**-admissibility *(n.).***

**admission** (əd-mish′ən, ad-mish′ən), ***n.*** (١) وەرگرتن (زانکۆ،
قوتابخانە، کۆمەڵ، ئەنجوومەن). (٢) چوونەژوورەوە.
(٣) مافی چوونەژوورەوە.
(٤) سەرانە؛ مزی چوونەژوورەوە (سینەما، تیاترۆ... هتد).
(٥) دان پیانان؛ پێلێنان؛ دان بە هەڵەدانان؛ چوونەژێر.

**admit** (əd-mit′, ad-mit′), ***v.t.*** (١) (ا) وەرگرتن (زانکۆ، قوتابخانە،
یانە، ڕێکخراو... هتد). (ب) لە خەستەخانە نوواندن:

***[ He was ~ted ( to the hospital ) yesterday. ]***

(٢) ڕێی چوونەژوورەوە دان؛ مافی چوونەژوورەوە دان.

(٣) ڕێگەدان؛ بواردان.
(٤) گرتن؛ جێگە تیابوونەوە: *( The theater ~s 200 persons.)*.
(٥) دان پیانان؛ پێ‌لێنان؛ چوونەژێر:
*( She will never ~ that she is wrong.)*

**admittance** (əd-mit′'ns, ad-mit′'ns), *n.* (١) وەرگرتن (زانکۆ، قوتابخانە، یانە... هتد). (٢) ڕێی چوونەژوورەوە دان؛ چوونەژوورەوە.

**admittedly** (əd-mit′id-li, ad-mit′id-li), *adv.* بێ گومان؛ بە پێ‌لێنانی گشتی.

**admix** (ad-miks′, əd-miks′), *v.t. & v.i.* تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵاوبوون.

**admixture** (ad-miks′chēr, əd-miks′chēr), *n.* (١) تێکەڵاو؛ ئاوێتە؛ هەمەچەشن. (٢) شتێکە کە دەکرێتە شتێکی ترەوە و لەگەڵیدا تێکەڵاو دەکرێت.

**admonish** (əd-mon′ish, ad-mon′ish), *v.t.* (١) وریاکردنەوە؛ پێ ووتن. (٢) تەمێ‌کردن؛ بەسەرداهاتن. (٣) سەرزەنشت کردن؛ چاو لێ سوورکردنەوە.

**admonition** (ad′mə-nish′ən), *n.* (١) وریاکردنەوە؛ پێ ووتن. (٢) تەمێ‌کردن؛ تەمێ. (٣) سەرزەنشت کردن؛ سەرزەنشت.

-admonitory *(adj.)*.

**adnoun** (ad′noun′), *n.* ئاوەڵناوی وەك ناو بەکارهێنراو:
( the lame, the blind, the poor )

**ado** (ə-dōō′), *n.* هەراوزەنا؛ سەرقاڵی و جموجوولی بێ هۆ یا خۆڕایی.

**adobe** (ə-dō′bi), *n.* (١) خشتی کاڵ؛ خشتی قوڕ. (٢) خانووی قوڕ؛ خانووی خشتی کاڵ. (٣) قوڕ یا گڵی خشت لێ دروستکراو.

**adolescence** (ad′'l-es′'ns), *n.* هەرزەکاری؛ کاتی هەرزەکاری.

-adolescency *(n.)*.

**adolescent** (ad′'l-es′'nt), *adj.* هەرزەکار.

**adopt** (ə-dopt′), *v.t.* (١) هەڵگرتنەوە (منداڵی ساوا)؛ گرتنەخۆ (منداڵ یا گەورە)؛ بەخێوکردن: *( to ~ a child)*. (٢) وەرگرتن و کردن بە هی خۆ (بیروڕا، ڕێباز): *( to ~ an idea)*. (٣) پەسەندکردن (ڕاپۆرت): *( The committee ~ed the report.)*.

-adoptable *(adj.)*; adopter *(n.)*; adoption *(n.)*.

**adoptive** (ə-dop′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە منداڵ هەڵگرتنەوە؛ هی وەرگرتن و کردن بە هی خۆ. (٢) لەڕێی منداڵ هەڵگرتنەوەوە خزمن.

**adorable** (ə-dôr′ə-b'l, ə-dōr′ə-b'l), *adj.* (١) شایانی پەرستن و خۆشویستنە؛ ئەپەرسترێت. (٢) [Colloq.]، جوان؛ جوانکیلە؛ خنجیلانە: *( an ~ child)*.

**adoration** (ad′ə-rā′shən), *n.* (١) پەرستن. (٢) خۆشویستن و ڕێزلێگرتنێکی زۆر: *( to treat someone with ~ )*.

**adore** (ə-dôr′, ə-dōr′), *v.t.* (١) پەرستن. (٢) زۆر ڕێزلێگرتن؛ زۆر خۆشویستن. (٣) [Colloq.]، بۆ شێت بوون؛ زۆر حەزلێکردن.

**adorn** (ə-dôrn′), *v.t.* ڕازاندنەوە؛ نەخشاندن؛ جوان کردن.

**adornment** (ə-dôrn′mənt), *n.* (١) ڕازاندنەوە؛ جوان کردن. (٢) شتی جوانی ڕازێنەرەوە (وەك خشڵ، نەخش و نیگار... هتد).

**adrenalin, adrenaline** (ad-ren′'l-in), *n.* ئەدرینالین: جۆرە هۆرمۆنێکە.

**adrift** (ə-drift′), *adv. & adj.* (١) سەرئاوکەوتوو؛ بێ لەنگەر. (٢) وێڵ؛ بێ ئامانج.

**adroit** (ə-droit′), *adj.* کارامە؛ زیرەك؛ دانا؛ کارزان.

**adulate** (aj′ə-lāt′), *v.t.* زۆر پیاهەڵدان؛ مەرایی کردن؛ شکۆپێدان.

-adulator *(n.)*.

**adulation** (aj′ə-lā′shən), *n.* پیاهەڵدانی لە ڕادە بەدەر؛ مەرایی.

**adult** (ə-dult′, ad′ult), *adj.* (١) هەراش (مرۆڤ)؛ باڵق. (٢) تایبەتی بە مرۆڤی هەراش: *( an ~ movie)*.

*n.* کەسێکی هەراش، پێگەیشتوو، یا گەورە؛ مرۆڤێکی هەژدەساڵ یا گەورەتر؛ باڵق.

**adulterate** (ə-dul′tēr-āt′), *v.t.* ڕوونکردنەوە؛ شل کردنەوە؛ خراپ کردن؛ ناپوختەکردن: *( to ~ milk with water)*.

*adj.* (١) ڕوون کراوە؛ ناڕاستەقینە؛ ناپوختە. (٢) داوێن پیس؛ زیناکەر.

**adulteration** (ə-dul′tēr-ā′shən), *n.* (١) ڕوونکردنەوە؛ خراپ کردن؛ ناپوختەکاری. (٢) شتێکی ڕوون کراوە یا ناپوختەکراو.

**adulterer** (ə-dul′tēr-ēr), *n.* داوێن پیس (پیاوی ژندار)؛ زیناکەر.

**adulteress** (ə-dul′tēr-is, ə-dul′tris), *n.* زیناکەر (ژن)؛ داوێن پیس (ژنی مێرددار).

**adulterous** (ə-dul′tēr-əs), *adj.* زیناکەر؛ داوێن پیس (پیاوی ژندار یا ژنی مێرددار).

**adultery** (ə-dul′tēr-i), *n.* داوێن پیسی (ژنی مێرددار یا پیاوی ژندار)؛ زینا؛ جووت بوونی حەرام.

**adulthood** (ə-dult′hood), *n.* تەمەنی هەژدە ساڵ و بەرەو ژوور؛ تەمەنی هەراشی.

**adumbrate** (ad-um′brāt, ad′əm-brāt′), *v.t.* (١) نەخشەکێشان بە ناڕوونی؛ وێنەکێشان. (٢) بەناستەم دەرخستن. (٣) پێشبینی کردن؛ نوقڵانەلێدان.

-adumbration *(n.)*.

**advance** (əd-vans′, ad-väns′), *v.t.* (١) پێشخستن؛ پەرەپێدان. (٢) پێشنیارکردن. (٣) بایەخ پێدان. (٤) پێشخستنی کاتی ڕوودان. (٥) بەرزکردنەوە (ڕێژە)؛ زیادکردن. (٦) پێشەکی پارەپێدان. (٧) قەرزپێدان.

*v.i.* (١) بۆ پێشەوە ڕۆیشتن: *( The troops have not ~d.)*. (٢) پێشکەوتن؛ پەرەسەندن. (٣) پلە بەرزبوونەوە؛ بەبەرزبوون.

*n.* (١) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن؛ چوونە پێشەوە. (٢) پێشکەوتن؛ پەرەسەندن. (٣) نرخ زیادبوون؛ بایەخ سەندن؛ پلە بەرزبوونەوە. (٤) پێشەکی؛ پارەی پێشەکی. (٥) قەرز. (٦) *(pl.)*، ( to ~ )، خۆبردنە پێشەوە؛ خۆ خۆشەویست کردن:
*( to make ~s to somebody)*

*adj.* (١) پێشەنگ؛ بەرایی: *( ~ guard)*. (٢) لەپێشەوە؛ لەپێشدا؛ پێشەکی: *( ~ information)*.

**in advance,** پێشەکی؛ لەپێشەوە؛ لەپێشدا.

**advanced** (əd-vanst′, ad-vänst′), *adj.* (١) پێشکەوتوو:
*( an ~ country)*
(٢) پێشکەوتنخواز: *( an ~ idea)*. (٣) پیر؛ بەساڵداچوو: *( an ~ age)*. (٤) بەرز (خوێندن): *( ~ studies)*.

**advance guard,** پێشەنگی لەشکر.

**advancement** (əd-vans′mənt), *n.* (١) پێشکەوتن؛ پەرەسەندن؛ پێشخستن. (٢) پلە بەرزی؛ پلە بەرزبوونەوە؛ بەرزی؛ سەرکەوتن.

**advantage** (əd-van′tij, ad-vän′tij), *n.* (١) کەڵك؛ سوود؛ قازانج. (٢) باشتربوون لە؛ زاڵی: *( to have an ~ over someone)*. (٣) بارێك یا ڕووداوێکی بەهات. (٤) یەکەم خاڵی براوەی یاری تەنس پاش بەرامبەربوون. (وشەی " deuce " ببینە).

*v.t.* کەڵك پێدان؛ سوود پێ بەخشین.

**have the advantage of,** باشتربوون لە؛ بەبرەوتر لە؛ زاڵتربوون لە.

**take advantage of,** بەکارهێنان بۆ سوود و ئامانجی نابەجێی خۆ؛ خەڵەتاندن: *( to take advantage of innocent people)*.

**to advantage,** بە باشی؛ بەشێوەیەك کە سوودی لێ وەربگیرێت.

**advantageous** (ad′vən-tā′jəs), *adj.* بەکەڵك؛ بەسوود؛ باش؛ بەنرخ.

**advent** (ad′vent), *n.* (١) هاتن؛ گەیشتن: *( the ~ of Islam)*.

(٢) [A-]. چوار یەك شەممەی پێش كریسمەس.
(٣) لەدایكبوونی عیسا.
**adventitious** (ad´ven-tish′əs), ***adj.*** (١) نازگماكی؛ دەرەكی.
(٢) لە جێی نائاساییدا دەردێت (ڕووەكناسی): ***( ~ leaves)*** .
**adventure** (əd-ven′chēr), ***n.*** (١) كرداری پڕ مەترسی.
(٢) سەركێشی؛ سەرەڕۆیی.
(٣) بەسەرهاتێكی خۆش (بەتایبەتی دڵداری یا گەشت).
***v.t. & v.i.*** وێران؛ پڕكێشی كردن.
**adventurer** (əd-ven′chēr-ēr), ***n.*** (١) كەسێكی سەركێش یا چاونەترس. (٢) سەربازی بە كرێ گیراو. (٣) كەسێكی فێڵباز؛ تەڵەكەباز.
**adventuresome** (əd-ven′chēr-səm), ***adj.*** = **adventurous.**
**adventurous** (əd-ven′chēr-əs), ***adj.*** (١) سەركێش؛ سەرەڕۆ؛ چاونەترس (٢) پڕ مەترسی؛ مەترسیدار
**adverb** (ad′vērb), ***n.*** ئاوەڵفرمان (ڕێزمان)؛ ئاوەڵكردار.
**adverbial** (əd-vũr′bi-əl, ad-vũr′byəl), ***adj.*** دەستەواژەیەك كە ئەركی ئاوەڵفرمان دەبینێت (ڕێزمان)؛ تایبەتی بە ئاوەڵفرمان (ڕێزمان).
**adversary** (ad′vēr-ser´i), ***n.*** دوژمن؛ ناحەز؛ دژكار.
**adverse** (əd-vũrs′, ad-vũrs′, ad′vērs), ***adj.*** (١) دژ؛ ناحەز.
(٢) خراپ؛ زیانبەخش؛ ناپەسەند: ***( to have an ~ effect)*** .
**adversity** (əd-vũr′sə-ti, ad-vũr′sə-ti), ***n.*** لێقەومان؛ نەهاتی؛ ناخۆشی؛ كارەسات؛ تەنگانە؛ ڕۆژی ڕەش.
**advertise** (ad′vēr-tīz´), ***v.t.*** بڵاوكردنەوە (بە ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە... هتد)؛ پەخش كردن؛ جاڕدان؛ ئاشكراكردن؛ بانگ هەڵدان.
**advertisement** (ad´vēr-tīz′mənt), ***n.*** ئاگاداری؛ بڵاوكراوە؛ بڵاونامە
**advertiser** (ad′vēr-tīz´ēr), ***n.*** بڵاوكەرەوە؛ پەخشكەر؛ جاڕچی.
**advertising** (ad′vēr-tīz´iŋ), ***n.*** (١) بڵاوكراوە؛ جاڕ؛ ئاگاداری.
(٢) بڵاونامەگەری.
***adj.*** تایبەتی بە بڵاوكراوە یا بڵاونامەگەری.
**advertize** (ad′vēr-tīz´), ***v.t. & v.i.*** = **advertise.**
**advice** (əd-vīs′), ***n.*** ئامۆژگاری؛ پەند؛ بەسەرداهاتن؛ تەمێ كردن؛ تەمێ
**advisable** (əd-vīz′ə-b'l), ***adj.*** وا باشە؛ وا چاكە؛ باش؛ چاك؛ پەسەند؛ دورووست؛ بەجێ.
**-advisability** ***(n.).***
**advise** (əd-vīz′), ***v.t. & v.i.*** ئامۆژگاری كردن؛ تەمێ كردن؛ پێ ووتن؛ بەسەرداهاتن
**advised** (əd-vīzd′), ***adj.*** بیری لێ كراوەتەوە؛ دەسەنقەست.
**advisedly** (əd-vīz′id-li), ***adv.*** لە ئەنجامی بیرلێكردنەوەدا؛ بە دەسەنقەست.
**advisement** (əd-vīz′mənt), ***n.*** بیرلێكردنەوەیەكی قووڵ؛ لێكۆڵینەوەیەكی وورد.
**take under advisement,** بە باشی بیرلێكردنەوە؛ بەووردی لێكۆڵینەوە.
**adviser, advisor** (əd-vīz′ēr), ***n.*** ئامۆژگاریكەر؛ ڕاوێژكەر.
**legal advisor,** پارێزەر.
**advisory** (əd-vī′zə-ri), ***adj.*** تایبەتی بە ئامۆژگاری كردن؛ ڕاوێژكاری: ***( an ~ board)*** .
***n.*** ووریاكردنەوە یا ئاگادارییەك دەربارەی ئاووهەواو باری ڕێگاوبان.
**advocacy** (ad′və-kə-si), ***n.*** لایەن گرتن؛ داواكردن؛ خواستن؛ بانگ بۆ هەڵدان.
**advocate** (ad′və-kit), ***n.*** (١) پارێزەر (دادگا).
(٢) لایەنگر؛ داواكەر؛ بانگ بۆ دەر: ***( an ~ of socialism)*** .
***v.t.*** لایەن گرتن (بیروباوەڕ)؛ پاڵپشتی كردن؛ داواكردن؛ بانگ بۆ هەڵدان.

**-advocator** ***(n.).***
**adz, adze** (adz), ***n.*** تەشوێ.
**aegis, egis** (ē′jis), ***n.*** (١) قەڵغانی خودایانە (ئەفسانەی یۆنانی).
(٢) پارێزگاری؛ پاراستن.
(٣) سەرپەرشتی؛ ئامۆژگاری؛ چاودێری؛ سایە.
**aeolian harp,** سنووقێكی ژێدارە كە با لێی دەدات ئاوازی لێوەدێت.
**aeon, eon** (ē′ən, ē′on), ***n.*** هەتا هەتا؛ كاتی بێ پایان؛ هەزاران ساڵ.
**-aeonian, eonian** ***(adj.).***
**aerate** (ā′ēr-āt´, âr′āt), ***v.t.*** (١) بەبادان (بۆ پاكردنەوە)؛ هەواگۆڕین.
(٢) ئۆكسجین تێكەڵاوكردن بە خوێن (لەڕێی هەناسەدانەوە)
(٣) گاز كردنە ئاوەوە (ئاوی سۆدە درووستكردن).
**aerator** (ā′ēr-ā´tēr, âr′ā-tēr), ***n.*** (١) ئامێری گاز كردنە ئاوەوە.
(٢) ئامێری هەواگۆڕ.
**aerial** (âr′i-əl, ā-êr′i-əl), ***adj.*** (١) هەوایی.
(٢) سووك وەك هەوا. (٣) خەیاڵی. (٤) بەرز؛ ئاسمانی.
(٥) تایبەتی بە فڕۆكە یا فڕین: ***( an ~ map)*** .
(٦) لە هەوادا دەڕوێت لەباتی خاك یا ئاو (زیندەوەرناسی).
***n.*** هەوایی (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن) (هەروەها **" antenna "**) .
**aerialist** (âr′i-əl-ist, ā-êr′i-əl-ist), ***n.*** تەنافبازی سەر تەناف یا جۆلانێی هەوایی.
**aerial ladder,** پەیژەی بەرزی سەر لۆری ئاگركوژێنەرەوە.
**aerification** (âr´ə-fi-kā′shən, ā´ēr-ə-fi-kā′shən), ***n.*** – (١) گۆڕین بۆ هەوا یا گاز. (٢) بەبادان؛ هەواگۆڕین.
**aerify** (ā-êr′ə-fī´, âr′ə-fī´), ***v.t.*** (١) گۆڕین بۆ هەوا یا گاز.
(٢) بەبادان (بۆ پاكردنەوە)؛ هەواگۆڕین.
**aero** (âr′ō, ā′ēr-ō), ***adj.*** تایبەتی بە فڕین یا فڕۆكە.
**aero-** (âr′ō, âr′ə, ā′ēr-ō, ā′ēr-ə), پێشگرێكە بەمانای: (١) هەوا؛ تایبەتی بە هەوا. (٢) تایبەتی بە فڕۆكە. (٣) گاز؛ تایبەتی بە گاز.
**aerobatics** (âr´ə-bat′iks, ā´ēr-ə-bat′iks), ***n.pl.*** نمایشی تەقلەبازی فڕۆكە.
**aerodrome** (âr′ə-drōm´, ā′ēr-drōm´), ***n.*** = **airdrome.**
**aerodynamics** (âr´ō-dī-nam′iks), ***n.pl.*** دینامیكی هەوا؛ كاری هەوا لەسەر فڕین.
**aerogram** (âr′ə-gram´, ā′ēr-ə-gram´), ***n.*** نامەی هەوایی.
**aerology** (âr-ol′ə-ji, ā´ēr-ol′ə-ji), ***n.*** زانستی لێكۆڵینەوەی هەواو فڕین؛ هەوازانی.
**aerometer** (âr-om′ə-tēr, ā´ēr-om′ə-tēr), ***n.*** پێوەری قورسی و چڕی هەواو گازی تر (ئامێر).
**aeronaut** (âr′ə-nôt´, ā′ēr-ə-nôt´), ***n.*** فڕۆكەوانی باڵۆن؛ باڵۆن لێخوڕ.
**aeronautic** (âr´ə-nô′tik, ā´ēr-ə-nô′tik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە زانستی فڕین. (٢) تایبەتی بە فڕۆكەوانی باڵۆن؛ تایبەتی بە باڵۆنەوان.
**aeronautics** (âr´ə-nô′tiks, ā´ēr-ə-nô′tiks), ***n.pl.*** زانستی- فڕین؛ فڕین و فڕۆكەوانی.
**aeroplane** (âr′ə-plān´, ā′ēr-ə-plān´), ***n.*** فڕۆكە.
**aerospace** (âr′ə-spās´), ***n.*** (١) بەرگەبای زەوی و ئاسمانی دەرەوە؛ زەوی‌وپۆش و ئاسمانی سەرووی؛ ئاسمانەی زەوی و ئاسمانی دەرەوە.
(٢) تەكنۆلۆجیای فڕین لەم ناوچانەدا.
**aerostat** (âr′ə-stat´, ā′ēr-ə-stat´), ***n.*** باڵۆن؛ كەشتی هەوایی.
**aesthete, esthete** (es′thēt), ***n.*** جوانی پەرست؛ جوانی زان.
**aesthetic, esthetic** (es-thet′ik), ***adj.*** تایبەتی بە جوانی زانی؛ تایبەتی بە جوانی پەروەری؛ جوانی.
**-aesthetically; esthetically** ***(adv.).***
**aesthetician, esthetician** (es´thə-tish′ən), ***n.*** جوانی زان؛

زانا یا هونەرمەندی جوانی.
**aestheticism** (es-thet′ə-siz'm), ***n.*** (١) جوانی زانی لە هونەرە جوانەکاندا (٢) جوانی پەرستی؛ هونەری جوانی پەروەری.
**aesthetics, esthetics** (es-thet′iks), ***n.pl.*** جوانی زانی؛ لێکۆڵینەوەی جوانی لە هونەردا.
**aether** (ē′thēr), ***n.*** = **ether.**
**aethereal** (i-thêr′i-əl), ***adj.*** = **ethereal.**
**afar** (ə-fär′), ***adv.*** لەدوورەوە؛ دوور.
**afeard, afeared** (ə-fêrd′), ***adj.*** [Archaic or Dial.], ترساو.
**affability** (af′ə-bil′ə-ti), ***n.*** ڕووخۆشی؛ ناسکی.
**affable** (af′ə-b'l), ***adj.*** ڕووخۆش؛ ناسك
**affably** (af′ə-bli), ***adv.*** بە ڕووخۆشی؛ بە ناسکی:
***( to behave ~ )***
**affair** (ə-fâr′), ***n.*** (١) کار؛ ئیش؛ فرمان.
(٢) (*pl.*)، کاروبار؛ کاروباری بازرگانی. (٣) مەسەلە؛ شت؛ ڕووداو.
(٤) دڵداری؛ دەست تێکەڵاوکردنی ژن و پیاوێك: ***( a love ~ )*** .
**affect** (ə-fekt′), ***v.t.*** کارتێکردن؛ کارکردنە سەر؛ گۆڕین.
***n.*** (١) [Obs.]، ئارەزوو؛ مەیل.
(٢) ا) هەست. (ب) هەست بزوێنەر؛ بزوێنەر.
**affect** (ə-fekt′), ***v.t.*** (١) حەزلێکردن؛ بەدڵ بوون (شتومەك).
(٢) وا دەرخستن؛ هەڵوێستی درۆزنە نواندن:
***( He ~ed indifference to their teasing.)***
**affectation** (af′ek-tā′shən), ***n.*** (١) وا نیشاندان؛ وا دەرخستن؛ خۆنواندن؛ خۆبادان؛ پۆز. (٢) خۆ تەسك کردنەوە؛ نازکردن؛ ناز.
**affected** (ə-fek′tid), ***adj.*** ڕووکەش؛ درۆ (ڕەووشت)؛ پۆزلێدەر.
**affected** (ə-fek′tid), ***adj.*** (١) تووش بوو (نەخۆشی).
(٢) کارلێکراو؛ کارتێکراو. (٣) هەست بزواو؛ هەست جووڵێنراو.
**affection** (ə-fek′shən), ***n.*** (١) مەیل.
(٢) خۆشەویستی؛ هەستی ناسك؛ هەستی گەرم.
(٣) نەخۆشی. (٤) تایبەخۆ.
**affectionate** (ə-fek′shən-it), ***adj.*** ناسك هەست؛ دڵ نەرم؛ بەبەزەیی؛ میهرەبان: ***( an ~ person)*** .
-affectionately ***(adv.).***
**affective** (ə-fek′tiv), ***adj.*** (١) هەستی؛ تایبەتی بە هەست.
(٢) هەست جووڵێنەر.
**affidavit** (af′ə-dā′vit), ***n.*** شایەتنامەی سوێند لەسەر خوراو؛ سوێندنامە.
**affiliate** (ə-fil′i-āt′), ***v.t.*** (١) گرتنەخۆ؛ وەرگرتن بە ئەندام.
(٢) خۆ پێوەبەستن؛ پەیوەندی گرتن لەگەڵ:
***( to ~ oneself with an organization)***
(٣) بۆ بنج و بناوان گەڕان (زمان، مرۆڤ).
***v.i.*** خۆ پێوەبەستن؛ چوونە ناو؛ بوون بە ئەندام.
***n.*** ئەندام (مرۆڤ، کۆمەڵە)؛ لق.
**affiliation** (ə-fil′i-ā′shən), ***n.*** پەیوەندی (کۆمەڵە، حیزب، یانە)؛ ئەندامێتی: ***( He has no party ~ .)*** .
**affinity** (ə-fin′ə-ti), ***n.*** (١) خزمایەتی (لەڕێی ژنهێنان و شووکردن)
(٢) پەیوەندی. (٣) لەیەکچوون؛ چوونیەکی.
(٤) خۆشەویستی؛ هاوهەستی؛ هۆگری.
**affirm** (ə-fũrm′), ***v.t.*** (١) پێ لێنان؛ شایەتی دان؛ لەسەر سووربوون.
(٢) چەسپاندن؛ دووپاتکردنەوە؛ پەسەندکردن.
***v.i.*** پێ لێنان؛ شایەتی دان؛ لەسەر سووربوون.
**affirmation** (af′ēr-mā′shən), ***n.*** (١) چەسپاندن؛ پەسەندکردن؛ دووپاتکردنەوە. (٢) شایەتی.
**affirmative** (ə-fũr′mə-tiv), ***adj. & n.*** ڕەزامەندی نواندن؛ بەڵێ.
**answer in the affirmative,** ڕەزامەندی پیشاندان؛ قایل بوون؛ وەڵام دانەوە بە بەڵێ.
**affix** (ə-fiks′), ***v.t.*** (١) پێوەنان؛ خستنەسەر؛ پێوەبەستن.
(٢) کردن بە پاشکۆ.
***n.*** (١) پاشکۆ. (٢) پێشگر، پاشگر، یا ناوبەند (ڕێزمان).
**afflict** (ə-flikt′), ***v.t.*** تووشی ناخۆشی و ئازار کردن؛ خەم و خەفەت پێدان؛ سوێ کردن بە دڵدا؛ جەرگ بڕین؛ دووچاربوون.
**affliction** (ə-flik′shən), ***n.*** ئێش و ئازار؛ ناخۆشی؛ کارەسات؛ خەم و خەفەت؛ نەخۆشی.
**afflicted** (ə-flik′tid), ***adj.*** نەخۆش؛ تووش بوو؛ کارەساتبار.
**affluence** (af′lōō-əns), ***n.*** (١) زۆرروزەبەنەیی؛ فرەیی؛ بێ شوماری.
(٢) دەوڵەمەندی؛ خۆش گوزەرانی؛ تێروتەسەلی.
(٣) بۆ چوون؛ بۆ هاتن؛ چوونە ناو.
**affluent** (af′lōō-ənt), ***adj.*** (١) دەوڵەمەند؛ خۆش گوزەران.
(٢) فرە؛ زۆرروزەبەنە؛ بێ شومار.
**afflux** (af′luks), ***n.*** بۆ چوون؛ بۆ ڕژیشتن:
***( an ~ of blood to the head)***
**afford** (ə-fôrd′, ə-fōrd′), ***v.t.*** (١) توانای کڕین بوون؛ پارە هەبوون (بۆ کڕین)؛ دەست ڕۆین: ***( Can you ~ to buy a house?)***
(٢) توانین؛ بۆ لوان؛ بۆ دەست دان: ***( I can ~ to speak frankly.)*** .
(٣) پێدان: ***( Music ~s her pleasure.)*** .
**affranchise** (ə-fran′chīz′), ***v.t.*** ئازادکردن؛ سەربەستی پێدان؛ بەرەڵاکردن.
**affray** (ə-frā′), ***n.*** مشتومڕ؛ شەڕ؛ شەڕەقسە؛ دەمەقاڵێ.
**affricate** (af′ri-kit), ***n.*** دەنگێك کە پەیدادەبێت لە وەستانی هاتوچۆی هەوا لە دەمدا و بەرەڵاکردنی بە کتوپڕی لەکاتی پرتەکردنی دەنگی وەك: " چ " یا " ج " لە ووشەی وەك: **church, clutch, judge** . (دەنگناسی).
**-affricative *(n. & adj.).***
**affright** (ə-frīt′), ***v.t.*** [Archaic], ترساندن؛ تۆقاندن.
***n.*** [Archaic], ترس.
**affront** (ə-frunt′), ***v.t.*** (١) بە سووك سەیرکردن؛ سووك کردن؛ شکاندن. (٢) بەرەنگاربوون؛ بەرەو ڕوو وەستان؛ لێ هەڵگەڕانەوە
***n.*** بە سووك سەیرکردن؛ شکاندن.
**Afgan** (af′gən, af′gan), ***n.*** (١) ئەفغانی؛ ئەفغانستانی؛ هاوڵاتی‌یەکی ئەفغانستان. (٢) زمانی ئەفغانی.
(٣) جۆرە سەگێکی باڵابەرزی تیسك درێژی باریکەلەی سەر باریکە.
(٤) [a-]، بەتانی‌یەك یا دەستماڵێکی خوری بە دەست چنراو.
**afield** (ə-fēld′), ***adv.*** (١) دوور؛ دوور لە ماڵ؛ دوور لە دەوروبەری خۆ:
***( Don't go too far ~ ; there will be a storm soon.)***
(٢) بۆ کێڵگە؛ لە کێڵگەدا؛ بۆ دەشت.
**afire** (ə-fīr′), ***adv. & adj.*** سووتاو؛ گڕگرتوو؛ ئاگرگرتوو.
**aflame** (ə-flām′), ***adv. & adj.*** سووتاو؛ گڕگرتوو؛ ئاگرگرتوو.
**afloat** (ə-flōt′), ***adj.*** (١) سەرئاوکەوتوو؛ بەسەر ئاوەوەیە.
(٢) لەناو کەشتیدا؛ لە دەریادا. (٣) بە ئاو داپۆشراو (زەمینەی کەشتی).
(٤) نەسووڕێنەوە بەبێ مەبەست. (٥) بە هەواوەیە.
(٦) بڵاو (قاو، ووتووات): ***( a rumor is ~ .)*** .
**keep afloat,** (١) بەسەر ئاوەوە مانەوە؛ نوقوم نەبوون.
(٢) قەرزار نەبوون؛ توانای دانەوەی هەموو قەرزێك هەبوون.
**afoot** (ə-foot′), ***adv. & adj.*** (١) بە پێ.
(٢) خەریکە دەکرێت یا ڕوودەدات؛ لە سازکردندایە:
***( Something is ~ . ; There was mischief ~ .)***
**afore** (ə-fôr′, ə-fōr′), ***adv., prep., conj.,*** لەپێشەوە؛ لەوەوپێش؛ لەمەوپێش.
**aforementioned** (ə-fôr′men′shənd, ə-fōr′men′shənd′) ***, adj.*** لەمەوپێش باسکراو؛ لەوەوپێش ناوبراو.

**aforesaid** (ə-fôr′sed′, ə-fōr′sed′), *adj.* لەمەوپێش باسکراو؛ لەوەوپێش ناوبراو.

**aforethought** (ə-fôr′thôt′, ə-fōr′thôt′), *adj.* لەپێشدا بیری لێکراوەتەوە یا لێی کۆڵراوەتەوە؛ پێشەکی نەخشە بۆ کێشراو.

**afoul** (ə-foul′), *adv. & adj.* لە تەنگ‌وچەڵەمەدا؛ لە گۆبەنگێکدا؛ لە ئاڵۆزییەکدا.

**run (or fall) afoul of,** تووش بوون؛ تێوەگلان؛ بەیەکدادان.

**afraid** (ə-frād′), *adj.* (١) ترساو؛ سڵکەر؛ ئەترسێ. (٢) بەداخەوە؛ ببوورە: ***(I am ~ I can't go.)*** .

**afresh** (ə-fresh′), *adv.* سەرلەنوێ؛ لە سەرەوە؛ لەنووکەوە.

**African** (af′ri-kən), *adj.* (١) ئەفەریقی (گەل، زمان، کلتوور). (٢) ڕەش؛ قولەڕەش.

**Afrikaner** (af′ri-kä′nĕr), *n.* هاووڵاتییەکی ئەفەریقای باشووری بە بنەچە ئەورووپایی.

**Afro-American** (af′rō-ə-mer′ə-kən), *adj.* تایبەتی بە قولەڕەشی ئەمەریکای بە بنەچە ئەفەریقایی.

***n.*** قولەڕەشێکی ئەمەریکای بە بنەچە ئەفەریقایی.

**aft** (aft, äft), *adj. & adv.* لە بەشی دواوەی کەشتیدا؛ پشتەوەی کەشتی.

**after** (af′tĕr, äf′tĕr), *adv.* لەپاش؛ لەپاشدا؛ لەدواییدا؛ لە دواتر.

***prep.*** (١) لەدواوە؛ لەپاش؛ لەپاشدا؛ لەدوای. (٢) بەدوادا گەڕان. (٣) لەدوای (کات)؛ دواتر لە. (٤) بەهۆی؛ پاش. (٥) هەرچەندە؛ لەگەڵ ئەوەشدا. (٦) لەخوار (پلە، گرنگی). (٧) بەناوی: ***(a child named ~ Lincoln)*** . (٨) وەک؛ لەسەر شێوازی: ***(a novel ~ Dickens' style)*** . (٩) لەبابەت؛ دەربارەی: ***(She asked ~ you.)*** .

***conj.*** لەدوای؛ لەپاش؛ دواتر.

***adj.*** (١) لەدواییدا؛ لەدوای ئەوە؛ لەپاش ئەوە. (٢) لەپشتەوەی کەشتییەک.

**after a fashion,** بە باشی نا؛ ئەختێک بە خراپی؛ هەر بەناو.

**after all,** (١) لەگەڵ ئەوەشدا. (٢) لە هەرە دواییدا.

**after you!** فەرموو لەپێشەوە برۆ! (چوونەژوورەوە لە دەرگایەکەوە).

**be after,** بەدوادا گەڕان؛ بۆ گەڕان.

**look after,** چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن:

***(Who will look after the children?)***

**take after,** لێچوون؛ لێکردن؛ وەک کەسێک وابوون:

***(He takes after his father.)***

**afterbirth** (af′tĕr-bûrth′, äf′tĕr-bûrth′), *n.* (١) ناووک بەندو ویلاش (کە لەکاتی منداڵبووندا دێتە دەرەوە). (٢) منداڵێکە کە لەدوای مردنی باوکی یا دوا وەسیەتنامەی لەدایک دەبێت.

**aftereffect** (af′tĕr-ə-fekt′, äf′tĕr-ə-fekt′), *n.* دوا ئەنجام؛ ئەنجام.

**afterlife** (af′tĕr-līf′, äf′tĕr-līf′), *n.* ڕۆژی قیامەت؛ پیری.

**aftermath** (af′tĕr-math′, äf′tĕr-math′), *n.* (١) ئەنجام (بەتایبەتی ناخۆش)؛ ئەنجامی کار: ***(Misery is often an ~ of war.)*** . (٢) لەدوای؛ یەکسەر لەدوای: ***(in the ~ of the war)*** . (٣) گژوگیای دووەمی وەرزێک کە پاش یەکەم دوورینەوە سەرهەڵدەداتەوە.

**aftermost** (af′tĕr-mōst′, äf′tĕr-mōst′), *adj.* دواترین؛ دوا؛ هەرە دوا.

**afternoon** (af′tĕr-nōōn′, äf′tĕr-nōōn′), *n.* پاش نیوەڕۆ؛ ئێوارە

***adj.*** پاش نیوەڕۆ؛ ئێوارە؛ تایبەتی بە پاش نیوەڕۆ.

**afterpains** (af′tĕr-pānz′, äf′tĕr-pānz′), *n.* ئێش و ئازار یا ژانی دوای منداڵبوون.

**aftertaste** (af′tĕr-tāst′, äf′tĕr-tāst′), *n.* (١) تام یا چێژی لەناو دەمدا ماوە (خواردن یا خواردنەوە). (٢) هەستی دوای بەسەرهاتێک.

**afterthought** (af′tĕr-thôt′, äf′tĕr-thôt′), *n.* بیرێک کە درەنگ بە مێشکدا دێت؛ تێبینی یا ڕوونکردنەوەیەکی درەنگ؛ پاش بیر.

**aftertime** (af′tĕr-tīm′, äf′tĕr-tīm′), *n.* دواڕۆژ.

**afterward** (af′tĕr-wĕrd, äf′tĕr-wĕrd), *adv.* لەدواییدا؛ لەپاشدا؛ دوای ئەوە؛ پاشان.

**afterwards** (af′tĕr-wĕrdz, äf′tĕr-wĕrdz), *adv.* = **afterward.**

**again** (ə-gen′, ə-gān′), *adv.* (١) دووبارە؛ دیسانەوە؛ سەرلەنوێ؛ جارێکی تر. (٢) لەسەرووی ئەوەیشەوە؛ زیاد لەوەیش. (٣) لە سەرێکی ترەوە؛ لە لایەکی ترەوە.

**again and again,** جار لەدوای جار؛ گەلێک جار.

**as much again,** دوو ئەوەندە؛ دوو قات؛ ئەوەندەی تریش.

**against** (ə-genst′, ə-gānst′), *prep.* (١) دژ: ***(to fight ~ evil)*** . (٢) بە؛ پیادا: ***(Throw the ball ~ the wall.)*** . (٣) بەپێچەوانەی: ***(to drive ~ the traffic)*** . (٤) بە قەد؛ بە سەر: ***(He leaned ~ the tree.)*** . (٥) بەرامبەر؛ بەتەنیشت: ***(dark colors ~ a fair skin)*** . (٦) لەبەر؛ بۆ تەنگانە: ***(food stored ~ winter)*** . (٧) دژ؛ خۆپاراستن لە: ***(protection ~ the cold)*** . (٨) لەسەر؛ لەسەر حسابی: ***(draw a check ~ one's bank balance)*** . (٩) بەرامبەر؛ نزیک

**agape** (ə-gāp′), *adv. & adj.* (١) واق وڕماو؛ سەرسووڕماو. (٢) داچەقیو (دەم)؛ داچەقاو؛ کراوە.

**agape** (ä′gä-pā′, ag′ə-pē′), *n.* (١) شێو یا جەژنی کۆنی خاچ‌پەرستەکان. (٢) خۆشەویستی خودا بۆ ئادەمیزاد؛ خۆشەویستی خودایی.

**agate** (ag′it, ag′ət), *n.* (١) جۆرە بەردێکی بەنرخە. (٢) کەسێکی بچکۆلە. (٣) تیپی بچووک (چاپەمەنی).

**age** (āj), *n.* (١) تەمەن (٢) ( ~ of )، تەمەنی هەراشی یا پێگەیشتن:

***(A man comes of ~ at twenty-one.)***

(٣) قۆناغێکی ژیان. (٤) پیری. (٥) بەرە؛ پشت. (٦) چەرخ. (٧) *(pl.)* [Colloq.]، ماوەیەکی دوورودرێژ؛ کاتێکی زۆر.

***v.i.*** پیربوون؛ بە ساڵدا چوون؛ گەورەبوون.

***v.t.*** پیرکردن.

**come of age,** هەراش بوون؛ گەیشتنە تەمەنی هەژدە یا بیست‌ویەک ساڵی.

**under age,** منداڵ؛ هەرزە؛ لەخوار تەمەنی هەژدە ساڵییەوە.

**aged** (ā′jid), *adj.* (١) پیر؛ کۆن. (٢) تەمەنی ئەوەندەیە: ***(~ five years)*** .

**the aged,** کەسانی پیر یا بەساڵداچوو؛ پیرەکان؛ پیران.

**ageless** (āj′lis), *adj.* (١) هەرگیز پیر نابێت؛ هەمیشە گەنج. (٢) هەمیشەیی؛ هەتاهەتایی.

**agelong** (āj′lôŋ′, āj′loŋ′), *adj.* (١) درێژخایەن. (٢) هەمیشەیی؛ هەتاهەتایی.

**agency** (ā′jən-si), *n.* (١) هێز؛ وزە. (٢) هۆ: ***(He got a job through the ~ of friends.)*** . (٣) نوێنەری (کاروبار، کۆمپانیا)؛ بریکاری؛ جێگری:

***(The company has ~ies all over the world.)***

(٤) بارەگای دەزگایەکی بریکاری. (٥) ئاژانس (دەنگوباس). (٦) دەزگای میری یا میللی.

**agenda** (ə-jen′də), *n.pl.* بەرنامە؛ کارنامە؛ لیستەی کار.

**agent** (ā′jənt), *n.* (١) کارکەر؛ بکەر. (٢) ماددە: ***(a chemical ~)*** . (٣) نوێنەر؛ دەڵاڵ؛ بریکار: ***(an insurance ~)*** . (٤) بە کرێ گیراو؛ نۆکەر؛ کلک. (٥) هۆ.

(٦) [Colloq.]، دەستگیر؛ چەرچی.

**age-old** (āj'ōld'), *adj.* کۆن؛ زۆر کۆن: *( an ~ problem)* .

**agglomerate** (ə-glom'ēr-āt'), *v.t. & v.i.* کۆمەڵ یا تۆپەڵ کردن؛ کۆکردنەوە

*adj.* کۆمەڵ کراو؛ تۆپەڵ کراو؛ کۆمەڵ.

*n.* کۆمەڵ؛ تۆپەڵ.

**agglomeration** (ə-glom'ēr-ā'shən), *n.* کۆمەڵ؛ تۆپەڵ؛ کۆمەڵ یا تۆپەڵ بوون؛ کۆمەڵ یا تۆپەڵ کردن.

**agglutinant** (ə-glōō't'n-ənt), *adj.* سرێشاوی؛ لینج.

*n.* ماددەی سرێشاوی یا لینج.

**agglutinate** (ə-glōō't'n-it), *adj.* (١) پێکەوەنووساو یا لکاو (وەك بە سرێش). (٢) ووشەی پەیوەست (زمانەوانی).

*v.t. & v.i.* (١) پێکەوەنووساندن (وەك بە سرێش).
(٢) پێکهێنانی ووشەی پەیوەست (زمانەوانی).

-agglutination *(n.)*.

**aggrandize** (ag'rən-dīz', ə-gran'dīz'), *v.t.* (١) گەورەکردن؛ زل کردن. (٢) شکۆپێدان. (٣) فووتێکردن؛ بە گەورەتر نووآندن؛ پێوەنان (درۆ).

-aggrandizement *(n.)*.

**aggravate** (ag'rə-vāt'), *v.t.* (١) ئاڵۆزکردن؛ خراپترکردن: *( to ~ a situation)*
(٢) [Colloq.]، پەستکردن؛ تووڕەکردن؛ ڕق هەڵسان: *( to ~ a person)* .

**aggravation** (ag'rə-vā'shən), *n.* (١) ئاڵۆسکاندن؛ خراپ کردن
(٢) ئاڵۆسکێنەر. (٣) [Colloq.]، پەستکەر؛ تووڕەکەر؛ ڕق هەڵسێنەر.

**aggregate** (ag'ri-git), *adj.* (١) سەرجەم؛ گشت؛ هەموو: *( ~ earnings, sales, etc.)*
(٢) تۆپەڵ؛ کۆمەڵ.

*n.* (١) کۆمەڵ؛ کۆمەڵ یا تۆپەڵێکی هەمەجۆر.
(٢) لم و چەوی لەگەڵ چیمەنتۆدا تێکەڵاوکراو.

*v.t.* (١) کۆمەڵ کردن؛ کۆکردنەوە؛ کردن بەیەك.
(٢) کردنە ئەوەندە؛ ئەوەندەبوون.

in the aggregate, بەگشتی؛ هەمووی؛ هەمووی پێکەوە.

-aggregation *(n.)*.

**aggress** (ə-gres'), *v.i.* هێرش بردنە سەر؛ شەڕ هەڵگیرسان؛ دەستپێشکەری کردن لە شەڕدا

**aggression** (ə-gresh'ən), *n.* هێرش؛ هێرش بردنە سەر؛ دەستدرێژی؛ شەڕفرۆشی؛ دڕی؛ دڕێتی.

**aggressive** (ə-gres'iv), *adj.* (١) دڕ؛ شەڕانی؛ دەستدرێژکەر.
(٢) بە هەڵمەت؛ چالاك.

**aggressor** (ə-gres'ēr), *n.* شەڕهەڵگیرسێنەر (مرۆڤ، ووڵات)؛ دەستدرێژکەر؛ پەلاماردەر؛ شەڕانی.

**aggrieve** (ə-grēv'), *v.t.* (١) ئازاردان؛ خەفەت پێدان؛ دڵ شکاندن.
(٢) ماف خواردن؛ زۆرداری لێکردن.

**aggrieved** (ə-grēvd'), *adj.* (١) ئازاردراو؛ دڵ شکاو؛ خەفەت پێدراو.
(٢) ماف خوراو؛ زۆرلێکراو.

**agha** (ä'gə), *n.* ئاغا

**aghast** (ə-gast', ə-gäst'), *adj.* تۆقیو؛ ترساو؛ سەرسووڕماو.

**agile** (aj'əl, aj'il, aj'īl), *adj.* چوستوچالاك؛ گورجوگۆڵ؛ بەهەڵمەت

**agility** (ə-jil'ə-ti), *n.* چوستوچالاکی؛ گورجوگۆڵی؛ هەڵمەت.

**agitate** (aj'ə-tāt'), *v.t.* (١) ڕاوەشاندن؛ شڵەقاندن.
(٢) وورووژاندن؛ هاندان؛ خرۆشاندن؛ جۆش دان؛ کلك پێوەکردن.

*v.i.* گێرەشێوێنی کردن؛ پشێوی خستنەوە؛ خرۆشاندن؛ جۆش دان؛ هاندان.

-agitable *(adj.)*.

**agitated** (aj'ə-tāt'id), *adj.* ئاڵۆزاو؛ خرۆشاو؛ وورووژاو؛ هەڵچوو

**agitation** (aj'ə-tā'shən), *n.* ئاڵۆزی؛ وورووژان؛ هاندان؛ پشێوی؛ گێرەشێوێنی.

**agitator** (aj'ə-tā'tēr), *n.* (١) گێرەشێوێن؛ ئاشووبگێڕ؛ وورووژێنەر.
(٢) ئامێری ڕاوەشاندن یا تێکهەڵدان.

**aglitter** (ə-glit'ēr), *adv. & adj.* شەوقدەرەوە؛ بەشەوق.

**aglow** (ə-glō'), *adv. & adj.* گەش؛ بەشەوق.

**agnail** (ag'nāl'), *n.* (١) زیادە نینۆك. (٢) برینی دەوروپشتی نینۆك.

**agnate** (ag'nāt), *n. & adj.* خزمی باوك.

**agnomen** (ag-nō'mən), *n.* نازناو.

**agnostic** (ag-nos'tik), *n.* کەسێك کە دەڵێت: نازانێت خودا هەیە یا نییە؛ کەسێکی خوانەناس؛ کەسێکی بێ بڕوا بە بوون و نەبوونی خودا

*adj.* خوانەناس؛ بێ بڕوا بە خودا.

**agnosticism** (ag-nos'tə-siz'm), *n.* بڕوا نەبوون بە بوون و نەبوونی خوا؛ خوانەناس؛ ڕێڕەوی گومانداری (ئاین).

**ago** (ə-gō'), *adj. & adv.* لەمەوپێش؛ لەمەوبەر؛ ڕابوردوو.

**agog** (ə-gog'), *adv. & adj.* بەتاسەوە؛ بەجۆش؛ بەپەرۆش.

**agon** (ä'gōn), *n.* ناکۆکی و کێشمەکێشی نێوان کەسانی شانۆگەرییەك.

**agone** (ə-gôn', a-gon'), *adj. & adv.* [Archaic], لەمەوبەر؛ لەوەوپێش؛ ڕابوردوو.

**agonistic** (ag'ə-nis'tik), *adj.* (١) تایبەتی بە پێشبڕکێی وەرزشی لە یۆنانی کۆندا. (٢) حەزکەر لە ناکۆکی و کێشمەکێش؛ جەنگاوەر.
(٣) بە زۆر کراو.

**agonize** (ag'ə-nīz'), *v.i.* (١) تێکۆشان؛ هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دان؛ زۆرانبازی کردن. (٢) پێوە ناڵاندن؛ پێوە تلانەوە؛ ئازار چەشتن.

*v.t.* چەوساندنەوە؛ ئازاردان؛ تووشی ئێش و ئازار کردن؛ سوێ کردن بە دڵدا.

**agonizing** (ag'ə-nīz'iŋ), *adj.* زۆر بە ئێش و ئازار؛ زۆر ناخۆش؛ بەسوێ: *( an ~ pain)* .

**agony** (ag'ə-ni), *n.* (١) ئێش و ئازارێکی زۆر؛ سوێ؛ ئەشکەنجە.
(٢) گیانەلا؛ لنگەفرتێی پێش مردن.

**agora** (ag'ə-rə), *n.* (١) کۆڕ؛ کۆڕێکی جەماوەری؛ کۆمەڵ (مرۆڤ)؛ کۆبوونەوە. (٢) شوێنی کۆبوونەوەی جەماوەر؛ بازاڕ.

**agoraphobia** (ag'ə-rə-fō'bi-ə), *n.* ترسێکی لە ئەندازە بەدەر لە شوێنی قەرەباڵغ و کراوە و فراواندا.

**agrarian** (ə-grâr'i-ən), *adj.* تایبەتی بە کشتوکاڵ و زەوی و زار؛ کشتوکاڵ؛ کشتوکاڵی: *( ~ reform)* .

*n.* لایەنگری دابەشکردنی زەوی و زار بە یەکسانی.

**agrarianism** (ə-grâr'i-ən-iz'm), *n.* (١) کشتوکاڵ کردن؛ کشتکاری. (٢) بزووتنەوەی دابەشکردنی زەوی و زار بە یەکسانی.

**agrarian reform,** چاکسازی کشتوکاڵ.

**agree** (ə-grē'), *v.i.* (١) قایل بوون؛ پەسەندکردن؛ سازان.
(٢) گونجان؛ شیان. (٣) ڕێکەوتن؛ پێکهاتن؛ هاوڕابوون.
(٤) ( ~ with )، پێکەوتن (خواردەمەنی، ئاووهەوا... هتد):
*( This climate does not ~ with him.; The food did not ~ with me.)*
(٥) گونجان (ڕێزمان).

**agreeable** (ə-grē'ə-b'l), *adj.* (١) خۆش؛ باش؛ پەسەند؛ جوان.
(٢) قایل؛ ڕازی؛ ڕەزامەند؛ گونجاو؛ حەزکەر؛ هەوەس لێ بوو.
(٣) ئاسوودە.

-agreeability *(n.)*; agreeably *(adv.)*.

**agreement** (ə-grē'mənt), *n.* (١) ڕێکەوتن؛ پێکهاتن؛ گونجان.
(٢) قایل بوون. (٣) پەیمان؛ ڕێکەوتننامە. (٤) قۆنتەرات.

**agricultural** (ag'ri-kul'chēr-əl), *adj.* تایبەتی بە کشتوکاڵ؛ کشتوکاڵی.

**agriculturalist** (ag'ri-kul'chēr-əl-ist), *n.* = agriculturist.

**agriculture** (ag'ri-kul'chēr), *n.* کشتوکاڵ.

**agriculturist** (ag'ri-kul'chēr-ist), *n.* (١) زانای کشتوکاڵ؛

هەوەسی جووت بوون.

**anaphrodisiac** (an-af´rə-diz′i-ak), ***adj. & n.*** هەوەسی جووت بوون نەهێڵ یا کەمکەرەوە (دەرمان).

**anarchic** (an-är′kik), ***adj.*** (١) بەرەڵا؛ بەرەڵای ڕامیاری. (٢) ئاژاوەپەرست؛ حەزکەر لە بەرەڵایی؛ دژ بە یاسا و دەستووروو نەریت.

**-anarchical** ***(adj.).***

**anarchism** (an′ẽr-kiz'm), ***n.*** (١) بیروباوەڕێکە دژ بە هەموو جۆرە فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوایییە؛ ئاژاوەخوازی. (٢) بەرهەڵستی کردنی هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوایی.

**anarchist** (an′ẽr-kist), ***n.*** ئاژاوەچی؛ ئاژاوەخواز؛ بەرەڵایی خواز؛ بەرەڵایی خوازی ڕامیاری؛ پشێوی خواز.

**-anarchistic** ***(adj.).***

**anarchy** (an′ẽr-ki), ***n.*** بەرەڵایی؛ بەرەڵایی ڕامیاری؛ ئاژاوە؛ پاشاگەردانی؛ پشێوی.

**anathema** (ə-nath′ə-mə), ***n.*** (١) کەسێك یا شتێکی لەعنەت لێکراو. (٢) شتێکی ناپەسەندی هەمووکەس ڕق لێ بوو. (٣) بە لەعنەت کردن و دەرکردنی کەسێك لە کڵێسە. (٤) لەعنەت.

**anathematize** (ə-nath′ə-mə-tīz´), ***v.t.*** بە لەعنەت کردن.

**anatomic** (an´ə-tom′ik), ***adj.*** = **anatomical.**

**anatomical** (an´ə-tom′i-k'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە توێکاری؛ تایبەتی بە یەکاڵاکردنەوەی لەش. (٢) تایبەتی بە پێکهاتنی لەش.

**-anatomically** ***(adv.).***

**anatomist** (ə-nat′ə-mist), ***n.*** (١) توێکاریزان؛ زانای توێکاری. (٢) شیکەرەوە؛ لێکۆڵەرەوە.

**anatomize** (ə-nat′ə-mīz´), ***v.t.*** (١) توێکاری کردنی لەش بۆ لێکۆڵینەوەی پێکهاتنی. (٢) شیکردنەوە.

**anatomy** (ə-nat′ə-mi), ***n.*** (١) توێکاری (زیندەوەر یا ڕووەك)؛ توێکاریزانی؛ یەکاڵاکردنەوەی لەش لە تاقیگەدا؛ توێکاری کردن. (٢) زانستی پێکهاتنی لەش. (٣) پەڕتووکی زانستی پێکهاتنی لەش. (٤) پێکهاتنی لەش و ئەندامەکانی. (٥) لەشی مرۆڤ. (٦) ئێسك. (٧) شیکردنەوە.

**ancestor** (an′ses-tẽr), ***n.*** باووباپیر؛ باپیرەگەورە.

**ancestral** (an-ses′trəl), ***adj.*** تایبەتی بە باووباپیر؛ هی باووباپیر: ***(an ~ home)***

**ancestress** (an′ses-tris), ***n.*** داپیرەگەورە

**ancestry** (an′ses-tri), ***n.*** (١) بنەچە؛ ڕەگەز. (٢) باووباپیر.

**anchor** (aŋ′kẽr), ***n.*** (١) لەنگەر (کەشتی، بەلەم). (٢) ڕاگرە؛ پشتیوان؛ پاڵپشت؛ لایەنگر.

***v.t.*** (١) جێگیرکردن. (٢) لەنگەرهاویشتن؛ لەنگەرفڕێدان؛ لەنگەرپێگرتن.

***v.i.*** (١) لەنگەرخستن؛ لەنگەرهاویشتن؛ لەنگەرگرتن. (٢) جێگیربوون.

**at anchor,** لەنگەرخستوو (کەشتی)؛ لەنگەرهاویشتوو.

**cast (or drop) anchor,** (١) لەنگەرخستن؛ لەنگەرهاویشتن. (٢) جێگیربوون

**drag anchor,** (١) ڕامالرانی بەلەم و کەشتی بەرەو کەناری دەریا لەبەر بێ لەنگەری. (٢) دۆڕانن؛ ژێرکەوتن.

**weigh anchor,** (١) لەنگەرهەڵکردن. (٢) ڕۆیشتن.

**anchorage** (aŋ′kẽr-ij), ***n.*** (١) مزی لەنگەرخستن. (٢) لەنگەرخستن؛ لەنگەرهاویشتن. (٣) لەنگەرگا. (٤) پشتیوان؛ پاڵپشت.

**anchorite** (aŋ′kə-rīt´), ***n.*** ووشکەسۆفی؛ قەلەندەر؛ خەلوەتخوا.

**anchor man,** (١) دوا کەسی گوریس کێشەکێ. (٢) قرە. (٣) دوا ڕاکەری تیپی ڕاکردنی دەست بە دەست گەیاندنی پێشبڕکێ. (٤) لەنگەر (مرۆڤ)؛ پشتیوان؛ کۆڵەکە (مرۆڤ)؛ بنە. (٥) سەردەستەی هەواڵ خوێنەران (تەلەفزیۆن، ڕادیۆ).

**anchovy** (an′chə-vi, an′chō´vi), ***n.*** ماسییەکی دەریایی زۆر بچووکە خوێ و بەهاراتی پێوەدەکرێت و دەکرێتە قوتووی سەرمۆرەوە.

**ancient** (ān′shənt), ***adj.*** (١) کۆن (کات)؛ دێرین؛ دێرزەمان. (٢) کۆن (شت)؛ کۆنە؛ پیر.

***n.*** (١) کەسێکی لە کۆندا ژیاو. (٢) کەسێکی پیر؛ پیر.

**the ancients,** (١) مرۆڤی کۆن (بەتایبەتی کاتی یۆنان و ڕۆمانەکان)؛ پێشینان. (٢) نووسەر و هونەرمەندانی کۆن.

**-anciently** ***(adv.)***; **ancientness** ***(n.).***

**ancient** (ān′shənt), ***n.*** [Archaic], (١) ئاڵا؛ بەیداخ. (٢) ئاڵاهەڵگر (سوپا).

**ancillary** (an′sə-ler´i), ***adj. & n.*** (١) بەردەست؛ ژێردەست. (٢) یاریدەدەر؛ پاشکۆ.

**and** (and; *unstressed,* ənd), ***conj.*** (١) و؛ وە؛ هەروەها؛ — یش. (٢) [Obs.]، ئەگەر. (٣) بۆئەوەی؛ بەڵکو: ***(Try ~ come today.)***.

**andiron** (and′ī´ẽrn), ***n.*** سێپا (ئاگردان)؛ سێ کوچکە.

**andro-, andr-** (an′drō, an′drə), پێشگرێکە بەمانای: (١) پیاو؛ نێر؛ نێرینە. (٢) نێرەك (گوڵ).

**androgen** (an′drə-jən), ***n.*** هۆرمۆنی نێرینە.

**androgenous** (an-droj′ə-nəs), ***adj.*** (١) منداڵ یا بەچەی نێری دەبێت. (٢) تەنها نێرەکی پێوەیە (ڕووەکناسی).

**androgyne** (an′drə-jin), ***n.*** ڕووەکێك کە نێرك و نێرەکی پێوەیە.

**androgynous** (an-droj′ə-nəs), ***adj.*** (١) نێرەموك. (٢) نێرك و نێرەکی پێوەیە لە هەمان کاتدا (ڕووەکناسی).

**-androus** (an′drəs), پاشگرێکە بەمانای: نێرکدار (ڕووەکناسی).

**anecdotal** (an´ik-dō′t'l), ***adj.*** (١) چیرۆکی؛ سەرگوزەشتەیی. (٢) پڕ لە چیرۆك.

**anecdote** (an′ik-dōt´), ***n.*** سەرگوزەشتە؛ چیرۆکێکی کورت و خۆش و ئەستەق.

**-anecdotic** ***(adj.)***; **anecdotist** ***(n.).***

**anelectric** (an´ə-lek′trik), ***adj.*** ناکارەبایی؛ کارەبای ناچێتە سەر بە لێکخشاندن.

**anemia** (ə-nē′mi-ə), ***n.*** نەخۆشی کەم خوێنی؛ خوێن کەمی.

**anemic** (ə-nē′mik), ***adj.*** کەم خوێن (نەخۆشی)؛ خوێن کەم: ***(an ~ person)***

**anemo-, anem-** (an′ə-mə, ə-nem′ə), پێشگرێکە بەمانای: با: ***(anemometer)***

**anemography** (an´ə-mog′rə-fi), ***n.*** زانستی پێوان و تۆمارکردنی خێرایی با.

**anemology** (an´ə-mol′ə-ji), ***n.*** ئەنیمۆلۆجی؛ زانستی با؛ بازانی

**anemometer** (an´ə-mom′ə-tẽr), ***n.*** پێوەری توندوتیژی و خێرایی با.

**anemometry** (an´ə-mom′ə-tri), ***n.*** خێرایی با پێوان.

**anemone** (ə-nem′ə-nē´), ***n.*** (١) گوڵاڵە. (٢) **sea anemone**.

**anemophilous** (an´ə-mof′ə-ləs), ***adj.*** لە یەك چاك کراو بەهۆی باوە (ڕووەکناسی).

**anemophily** (an´ə-mof′ə-li), ***n.*** لەیەك چاك کران بەهۆی باوە (ڕووەکناسی).

**aneroid** (an′ẽr-oid´), ***adj.*** ووشك؛ شلە بەکارنەهێنەر: ***(an ~ barometer)***

***n.*** = **aneroid barometer.**

**aneroid barometer,** پەستانپێوی ووشك؛ بارۆمەتری کانزایی.

**anesthesia** (an´əs-thē′zhə, an´əs-thē′zhi-ə), ***n.*** بەنج؛ سڕکردن (پزیشکەوانی).

**anesthesiology** (an´əs-thē´zi-ol′ə-ji), ***n.*** زانستی بەنج یا سڕکردن.

**anesthetic** (an´əs-thet′ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە بەنج یا سڕکردن. (٢) سڕکەر (دەرمان).

*n.* دەرمانی بەنج یا سڕکردن.

**anesthetist** (ə-nes′thə-tist), *n.* پزیشکی بەنج؛ بەنجکەر.

**anesthetize** (ə-nes′thə-tīz´), *v.t.* بەنج کردن؛ سڕکردن؛ هەست کوشتن.

**anew** (ə-nōō′, ə-nū′), *adv.* (١) سەرلەنوێ؛ دیسانەوە؛ دووبارە.
(٢) بە شێوەیەکی تازە.

**angel** (ān′jəl), *n.* (١) فریشتە؛ پەری.
(٢) مرۆڤێکی باش و پاک و بەسزمان و بەبەزەیی و جوان.
(٣) پارەیەکی زێڕی کۆنی ئینگلیزییە.
(٤) [Slang]: کەسێك کە پارە دادەنێت بۆ نوواندنی شانۆگەرییەك.

**angelfish** (ān′jəl-fish´), *n.* (١) جۆرە سەگ ماسییەکە پەرەکانی لە باڵ دەچێت (٢) جۆرە ماسییەکی رەنگاورەنگە.

**angelic** (an-jel′ik), *adj.* (١) فریشتەیی.
(٢) وەك فریشتەیە لە بەسزمانی و پاکی و چاکی و بەبەزەیی و جوانیدا.

**anger** (aŋ′gẽr), *n.* (١) تووڕەیی؛ تووڕەبوون؛ ڕق؛ قین.
(٢) [Obs.]: ئازار؛ ناخۆشی؛ نەخۆشی.
(٣) [Dial.]: هەوکردنی برین.

*v.t.* (١) تووڕەکردن؛ ڕق هەڵساندن؛ قین هەڵساندن.
(٢) [Dial.]: هەوپێکردنی برین.

**angina** (an-jī′nə, an′ji-nə), *n.* (١) وەناق؛ نەخۆشییەکی قوڕگە دەبێتە هۆی هەناسە بۆ نەدران. (٢) **angina pectoris** .

**angina pectoris,** نەخۆشییەکی دڵە دەبێتە هۆی سنگ ئێشان و هەناسە بۆ نەدران؛ سنگەوەناق.

**angle** (aŋ′g'l), *n.* (١) گۆشە (٢) سووچ؛ کونج؛ قوژبن.
(٣) ڕوو (مەسەلە. گیروگرفت)؛ لا:

*( to consider the question from all ~s)*

(٤) باری سەرنج.
(٥) [Slang]: پیلان؛ فێڵ.

*v.t. & v.i.* (١) بە لابەلایی جووڵاندن یا وەرگێڕان.
(٢) بە خواری لێدان (تۆپ).
(٣) [Colloq.]: گۆڕین یا شێواندنی دەنگوباسێك بۆ مەبەستی تایبەتی خۆ؛ لێدووان لە گۆشەیەکی تایبەتییەوە.

**angle** (aŋ′g'l), *n.* قولاپی ڕاوەماسی

*v.i.* (١) ماسی گرتن بە قولاپ
(٢) هەوڵدان بۆ شتێك بە فێڵ و تەڵەکە و پیلان:

*( He ~d for her attention.)*

**angled** (aŋ′g'ld), *adj.* گۆشەدار

**Angles** (aŋ′g'lz), *n.pl.* تیرەیەکی ئەڵمانی بوو کە لە سەدەی پێنجەمی زایندا کۆچیان کرد بۆ ئینگلتەرە و لەوێ جێگیر بوون وە ناوی " ئینگلیز " و " ئینگلتەرە " لە ناوی ئەم تیرەیەوە هاتووە.

-Anglian *(adj.)*.

**angleworm** (aŋ′g'l-wũrm´), *n.* کرمێکە دەکرێت بە قولاپەوە بۆ ماسی گرتن

**Anglican** (aŋ′gli-kən), *adj.* (١) تایبەتی بە ئینگلتەرە و کلتوورو گەلەکەی. (٢) تایبەتی بە کڵێسەی " ئەنگلیکانی " ، واتە ئینگلیزی.

*n.* ئەندامی کڵێسەی " ئەنگلیکانی " .

**Anglicanism** (aŋ′gli-kən-iz'm), *n.* بیروباوەڕو ڕێبازی کڵێسەی " ئەنگلیکانی "

**Anglicism, anglicism** (aŋ′glə-siz'm), *n.* (١) ووتە، ووشە، یا زاراوەیەکی تایبەتی بە زمانی ئینگلیزی.
(٢) شتێکی تایبەتی بە گەل و وڵاتی ئینگلیز.

**Anglicist** (aŋ′glə-sist), *n.* زانای زمان و وێژەی ئینگلیزی.

**Anglicize** (aŋ′glə-sīz´), *v.t. & v.i.* گۆڕین بە ئینگلیزی (زمان، ووتە، ڕەفتار، خوو و نەریت)؛ وەك ئینگلیزی یا ئینگلیز لێکردن.

**Anglify** (aŋ′glə-fī´), *v.t.* = Anglicize.

**angling** (aŋ′gliŋ), *n.* ماسی گرتن بە قولاپ.

**Anglo-** (aŋ′glō), پێشگرێکە بەمانای: ئینگلیزی؛ ئینگلیزی و... .

**Anglo-American** (aŋ′glō-ə-mer′ə-kən), *adj.* ئینگلیزی- ئەمریکی؛ تایبەتی بە ئینگلیزی- ئەمەریکی.

*n.* ئەمەریکییەك کە لە بنەچەی ئینگلیز بێت.

**Anglophile** (aŋ′glə-fīl´, aŋ′glō-fīl´), *n. & adj.* دۆستی- ئینگلیز و ئینگلتەرە؛ ئینگلیزدۆست.

**Anglophobe** (aŋ′glə-fōb´, aŋ′glō-fōb´), *n.* کەسێك کە قینی لە ئینگلیز و ئینگلتەرەیە و لێیان دەترسێت.

**Anglophobia** (aŋ´glə-fō′bi-ə, aŋ´glō-fō′bi-ə), *n.* ترس و قین لێبوونی ئینگلیز و ئینگلتەرە.

**Anglo-Saxon** (aŋ′glō-sak′s'n), *n.* (١) ئەنگلۆ-ساکسۆنی: ئەندامێکی تیرەکانی ئەنگلۆ-ساکسۆنە کە لە ئینگلتەرە جێگیر بوون هەتا ساڵی (١٠٦٦) ی زایینی. (٢) زمانی ئەنگلۆ-ساکسۆنی (کە پێشی دەووترێت: " ئینگلیزی کۆن " Old English ) . (٣) ئینگلیزێك؛ کەسێکی ئینگلیزی کە لە بنەچەی ئەنگلۆ-ساکسۆن بێت.

*adj.* (١) ئەنگلۆ-ساکسۆنی (زمان، کلتوور).
(٢) ئینگلیز؛ تایبەتی بە وەچەی ئەنگلۆ-ساکسۆنی.

**Angora** (aŋ-gôr′ə, aŋ-gō′rə, aŋ′gə-rə), *n.* (١) پشیلەیەکی تووك درێژو نەرمە. (٢) (ا) بزنێکە بۆ مەرەزەکەی بەخێودەکرێت. (ب) مەرەز.
(٣) (ا) جۆرە کەروێشکێکی ماڵییە. (ب) لەزووی تووکی ئەم جۆرە کەروێشکە

**angrily** (aŋ′grə-li), *adv.* بەتووڕەییەوە؛ بەڕقەوە.

**angry** (aŋ′gri), *adj.* (١) تووڕە؛ ڕق هەڵساو؛ دڵپڕ؛ پەست.
(٢) داگیرساو و بەئازار (برین).

**anguish** (aŋ′gwish), *n.* ئێش و ئازارێکی توندوتیژی دەروون و مێشك یا لەش؛ خەم و خەفەتێکی زۆر؛ ئەشکەنجە:

*( He was in ~ over the divorce.)*

*v.t.* ئێش و ئازار پێدان؛ خەم وخەفەت پێدان.

*v.i.* بە ئێش و ئازارەوە تلانەوە؛ زۆر خەم وخەفەت خواردن.

**angular** (aŋ′gyoo-lẽr), *adj.* (١) گۆشەدار.
(٢) ڕەقەڵە (مرۆڤ)؛ لەڕولاواز.
(٣) شان تەختە: *( an ~ stride)* .

-angularity *(n.)*.

**angulate** (aŋ′gyoo-lit), *adj.* گۆشەدار.

*v.t. & v.i.* گۆشەکاری؛ گۆشەکاری کردن.

-angulation *(n.)*.

**anhydrous** (an-hī′drəs), *adj.* بێ ئاو؛ ووشك.

**anil** (an′il), *n.* (١) دار چویت. (٢) خومی شین؛ ڕەنگی نیلی.

**anile** (an′īl, ā′nīl, an′il), *adj.* خلەفاو؛ پیرێژنی.

**aniline** (an″l-ēn′, an″l-in, an″l-īn′), *n.* شلەیەکی چەوری ژەهراوییە لە بەنزین دەردەهێنرێت و خومی لێ درووست دەکرێت.

**anility** (ə-nil′ə-ti), *n.* ووتە، کردەوە، یا بیرێکی خلەفاوانە.

**anima** (an′ə-mə), *n.* گیان؛ ڕۆح.

**animadversion** (an´ə-mad-vũr′zhən), *n.* ڕەخنە؛ لۆمە.

**animadvert** (an´ə-mad-vũrt′), *v.t.* ڕەخنەگرتن.

**animal** (an′ə-m'l), *n.* (١) گیاندار؛ زیندەوەر؛ بێ زمان؛ چوارپێ.
(٢) مرۆڤێکی دڕندەی بەدڕەوشت.

*adj.* (١) تایبەتی بە گیاندار. (٢) نزم (هەست)؛ تایبەتی بە هەستی جووت بوون و لەش نەك هەستی بەرز: *( ~ desires)* .

**animalcule** (an´ə-mal′kyool), *n.* زیندەوەرێکی گەردبینی؛ زیندەوەرێکی بە چاو نەبینراو.

**animalculum** (an´ə-mal′kyoo-ləm), *n.* = **animalcule.**

**animal husbandry,** وواڵغ و مەڕومالات بەخێوکردن.

**animalism** (an′ə-m'l-iz'm), *n.* (١) سرووشت و کردارو ئارەزووی گیانەوەر. (٢) بیروباوەڕێکە دەڵێت: مرۆڤ هیچی جیاواز نییە لە زیندەوەرانی

تر.

**animality** (an´ə-mal′ə-ti), *n.* (١) سرووشتی گیانەوەر.
(٢) جیهانی گیانداران؛ گیانداران.

**animalize** (an′ə-m'l-īz´), *v.t.* وەك چوارپێ لێکردن؛
هەستی چوارپێیی دەربڕین.

**animal kingdom,** جیهانی گیانداران؛ هەموو گیانداران؛ گیانەوەر.

**animal magnetism,** (١) نوواندنی موگناتیسی.
(٢) توانای دڵفڕاندن. (٣) هەستو سرووشتی ئاڵۆشو جووت بوون.

**animate** (an′ə-māt´), *v.t.* (١) زیندووکردنەوە؛ بووژاندنەوە.
(٢) هێنانە جۆش؛ بزوواندن؛ خستنە جمو جووڵ.

*adj.* (١) زیندوو (٢) بەجۆش؛ چالاك؛ زیت.

**animated** (an′ə-māt´id), *adj.* (١) بەجۆش؛ گەرم (گفتوگۆ): *( an ~ discussion)*
(٢) لە زیندووچوو؛ بزۆك: *( an ~ doll)* .

**animated cartoon,** کارتۆنی بزۆك: فیلمێکی سینەمایییە لە کارتۆنی بزۆك پێکهاتووە.

**animater, animator** (an′ə-māt´ēr), *n.* (١) بزوێنەر
(٢) دروستکەری فیلمی کارتۆنی بزۆك.

**animation** (an´ə-mā′shən), *n.* (١) بزوان؛ بزواندن.
(٢) ژیان؛ زیندوویتی. (٣) جۆش؛ گورجوگۆڵی؛ چالاکی.
(٤) فیلم کارتۆنی بزۆك دروستکردن.

**animosity** (an´ə-mos′ə-ti), *n.* کینە؛ قین؛ ڕق؛ دوژمنایەتی؛
قینەبەرایەتی؛ ڕقەبەرایەتی.

**animus** (an′ə-məs), *n.* (١) هێزێکی بزوێنەر؛ بزوێنەر. (٢) نیاز.
(٣) کینە؛ قین؛ ڕق؛ دوژمنایەتی؛ قینەبەرایەتی؛ ڕقەبەرایەتی.

**anise** (an′is), *n.* (١) ڕازیانە؛ ئەنیسۆن.
(٢) تۆوی بۆن خۆشی ڕازیانە.

**aniseed** (an′i-sēd´), *n.* تۆوی ڕازیانە

**ankle** (aŋ′k'l), *n.* قولەپێ؛ قولەقاچ؛ قاپ؛ خرتکە.

**anklebone** (aŋ′k'l-bōn´), *n.* خرتکە؛ قاپ

**anklet** (aŋ′klit), *n.* (١) پاوانە؛ خڕخاڵ.
(٢) گۆرەوی کورتی ژنانە.

**ankylosis** (aŋ´kə-lō′sis), *n.* (١) بوون بە یەکی چەند ئێسقانێک–
(تونکاری). (٢) بەگیروەستانی جومگە (نەخۆشی).

**annals** (an′'lz), *n.pl.* (١) مێژووی ساڵانە. (٢) مێژوو.
(٣) (*sing.*). مێژووی ساڵێك.
(٤) تۆمارنامەی کاروباری ڕێکخراوێك؛ گۆڤاری ڕێکخراوێکی زانستی.

**anneal** (ə-nēl′), *v.t.* (١) ئاودانەوە (پۆلا؛ شووشە... هتد)؛
جۆشدانی کانزاو ساردکردنەوەی بۆ ڕەق کردنی.
(٢) بەهێزکردن (وورە، مێشك)؛ وورە دانەبەر.
(٣) [Archaic]، سوورکردنەوە (خشت، گۆزەودیزە).

**annex** (ə-neks′), *v.t.* (١) دانەدەم (خانوو، زەوی، ناوچە، وولات)؛
داگیرکردنو خستنەسەر وولاتی خۆ: *( Japan ~ed Korea in 1910.)* .
(٢) [Archaic]، پێوەبەستن.

*n.* (١) زیادەیەك کە خرابێتە سەر خانوویەك (وەك ژوورێك).
(٢) خانوویەکی بچووکی نزیك بە خانوویەکی گەورە کە بەشێك بێت لێی:
*( an ~ to a hotel)*
(٣) پاشکۆ.

**annexation** (an´ek-sā′shən), *n.* (١) دانەدەم؛ خستنەسەر؛
خرانەسەر؛ داگیرکرانو درانەدەم: *( the ~ of new territory by force)* .
(٢) شتێکی دراوەدەم یا خراوەسەر.

**-annexationist** *(n.).*

**annexment** (ə-neks′mənt), *n.* پاشکۆ.

**annihilate** (ə-nī′ə-lāt´), *v.t.* لەناوبردن؛ فەوتاندن؛ قەلاچۆکردن؛
نەهێشتن؛ بنبڕکردن *( to ~ a race, nation, spieces, etc.)* .

**-annihilator** *(n.).*

**annihilation** (ə-nī´ə-lā′shən), *n.* لەناوبردن؛ فەوتان؛ قەلاچۆ؛
نەهێشتن؛ بنبڕکردن: *( His people were faced with ~ .)* .

**anniversary** (an´ə-vūr′sēr-i), *adj.* یادی ساڵانە (شۆڕش،
ژنهێنانو شووکردن، ڕووداوی گرنگ)؛ ساڵیاد:
*( the tenth ~ of the revolution; a wedding ~ ;*
*the ~ of Shakespeare's birth)*

*adj.* (١) تایبەتی بە یادی ساڵانە: *( an ~ dinner)* .
(٢) ساڵانە؛ هی ساڵانە.

**anno Domini** (an′ō dom′ə-nī´), [L.], *Abbr.* **A.D.,** ساڵی–
زاین.

**anno mundi** (an′ō mun′dī), [L.], لە ساڵی ئەوەندەدا پاش
دروستبوونی جیهان.

**annotate** (an′ō-tāt´), *v.t. & v.i.* ڕوونکردنەوە لەسەر پەراوێز یا
دامێنی پەڕتووکێك (بەتایبەتی بەرهەمێکی وێژەیی یا باسێکی تر).

**annotation** (an´ō-tā′shən), *n.* ڕوونکردنەوەی باسێکی قورس
لەسەر پەراوێزو دامێنی پەڕتووکێك.

**annotator** (an′ō-tā´tēr), *n.* ڕوونکەرەوەی باسێکی قورس لەسەر
پەراوێزو دامێنی پەڕتووکێك.

**announce** (ə-nouns′), *v.t.* (١) بڵاوکردنەوە؛ ئاشکراکردن؛ جاڕدان.
(٢) ووتن؛ ڕاگەیاندن.
(٣) ئاشکراکردن یا جاڕدانی هاتنێك: *( to ~ a caller)* .
(٤) بڵاوکردنەوە یا پەخشکردن لەسەر ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن.

*v.i.* وەك بڵاوکەرەوە فرمان دەکات (لەسەر ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن).

**announcement** (ə-nouns′mənt), *n.* (١) بڵاوکردنەوە؛ جاڕدان؛
ئاشکراکردن. (٢) جاڕ؛ بڵاونامە؛ بڵاوکراوە؛ ئاگاداری.
(٣) بڵاوکراوە یا ئاگادارییەکی نووسراو.

**announcer** (ə-noun′sēr), *n.* (١) بڵاوکەرەوە؛ جاڕدەر؛ ئاشکراکەر.
(٢) بڵاوکەرەوەی سەر ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن.

**annoy** (ə-noi′), *v.t.* (١) پەستکردن؛ سەرئێشاندن؛ بێزارکردن.
(٢) تووڕەکردن؛ ڕق هەڵساندن. (٣) ئازاردان.

**annoyance** (ə-noi′əns), *n.* (١) پەستکردن. (٢) پەست بوون.
(٣) پەستکەر (مرۆڤ، شت، کردەوە)؛ شتێکی ناخۆش.

**annoying** (ə-noi′iŋ), *adj.* ناخۆش؛ پەستکەر؛ بێزارکەر:
*( He is very ~ . ; It's very ~ to miss a train.)*

**annual** (an′yoo-əl), *adj.* (١) ساڵانە؛ هەموو ساڵێك؛ ساڵی جارێك؛
ساڵەوساڵ: *( an ~ meeting)* .
(٢) تایبەتی بە ساڵێك؛ هی ساڵێك: *( an ~ wage, salary, etc.)* .
(٣) ساڵانە (ڕووەك)؛ یەك وەرزی.

*n.* (١) گۆڤاری ساڵانە؛ پەڕتووکی ساڵانە.
(٢) ڕووەکی یەك وەرزی یا یەك ساڵانە.

**annually** (an′yoo-ə-li, an′yool-i), *adv.* هەموو ساڵێك؛ ساڵانە.
ساڵی جارێك: *( He makes twenty thousand dollars ~ . ;*
*They meet ~ .)*

**annuity** (ə-nū′ə-ti, ɔ-nōō′ɔ-ti), *n.* (١) پارە یا دەسکەوتێکی بۆ
بڕاوەی ساڵانە. (٢) مافی وەرگرتنی دەسکەوت یا پارەیەکی بۆ بڕاوەی وەها.
(٣) (ا) قازانجی ساڵانەی سەرمایەیەکی وەبەرهێنراو.
(ب) سەرمایەیەکی وەبەرهێنراوی وەها کە قازانجێکی ساڵانە دەست
خاوەنەکەی بخات.

**annul** (ə-nul′), *v.t.* سڕینەوە (مارە، پەیمان)؛ هەڵوەشاندنەوە؛
بەتاڵ کردنەوە: *( to ~ a marriage)* .

**annular** (an′yoo-lēr), *adj.* ئەلقەیی؛ خڕ.

**annulate** (an′yoo-lit, an′yoo-lāt´), *adj.* لە ئەلقە پێکهاتوو؛
ئەلقە ئەلقە.

**annulation** (an´yoo-lā′shən), *n.* (١) ئەلقەبەستن.

(٢) ئەلقە؛ شتێکی ئەلقەیی.

**annulet** (an′yoo-lit), *n.* ئەلقەیەکی بچووک.

**annulment** (ə-nul′mənt), *n.* بەتاڵ کردنەوە (مارە، پەیمان)؛ هەڵوەشاندنەوە: *( the ~ of their marriage)* .

**annum** (an′əm), *n.* ساڵێك؛ ساڵ؛ ساڵانە: *( per ~ )* .

**annunciate** (ə-nun′shi-āt′, ə-nun′si-āt′), *v.t.* بڵاوکردنەوە؛ ئاشکراکردن؛ پەخشکردن.

**annunciation** (ə-nun′shi-ā′shən), *n.* (١) ئاشکراکردن؛ بڵاوکردنەوە (٢) بڵاوکراوە؛ ئاگاداری.
(٣) [A-]. مژدەدانی جبرائیل بە مەریەم کە عیسای دەبێت.
(٤) [A-]. ئاهەنگی یادنامەی ساڵانەی ئەم مژدەیە؛ ساڵیادی ئەم مژدەیە.

**annunciator** (ə-nun′shi-ā′tēr), *n.* (١) بڵاوکەرەوە؛ مژدەدەر.
(٢) ئامێرێکە پیشانی کارگەرانی میوانخانە یا فەرمانگەیەك دەدات لە چی ژوورێکەوە زەنگێك لێدراوە.

**anode** (an′ōd), *n.* جەمسەری گەرمی باتری و رادیۆ... هتد.

**anodyne** (an′ə-dīn′), *adj.* ئێش وئازارکوژ
*n.* دەرمانی ئێش وئازارکوژ

**anoint** (ə-noint′), *v.t.* (١) هەنوون بە ڕۆن یا مەلحەم؛ چەورکردن.
(٢) بە ڕۆنی پیرۆز چەورکردنی ناوچەوانی پیاوێکی ئاینی گەورە یا فەرمانڕەوایەك بە بۆنەی دەست بەکارکردنییەوە؛ پیرۆزکردن؛ پەسەندکردن.
**-anointment** *(n.).*

**anomalous** (ə-nom′ə-ləs), *adj.* نائاسا؛ نائاوێزە

**anomaly** (ə-nom′ə-li), *n.* (١) نائاسایی؛ ناوێزەیی
(٢) شتێکی ناوێزە، یا سەیر: *( A bird that cannot fly is an ~ .)*
**-anomalistic** *(adj.).*

**anomie, anomy** (an′ə-mi), *n.* (١) بەرەڵایی کۆمەڵایەتی.
(٢) هەستی ئاوارەیی و نائومێدی و بێزاری لە ژیان.

**anon** (ə-non′), *adv.* (١) بەم زووانە؛ زوو
(٢) جارێکی تر؛ لە کاتێکی تردا
(٣) [Archaic]. یەکسەر؛ دەستبەجێ.
**ever and anon,** جارجار؛ جارنەجار؛ جاربەجار

**anonym** (an′ə-nim), *n.* (١) کەسێکی بێ ناو یا ناو نەزانراو
(٢) ناوی نهێنی؛ ناوی درۆ.

**anonymity** (an′ə-nim′ə-ti), *n.* ناونەزانراوی؛ بێ ناوی؛ نەناسراوی؛ وونی (ناو).

**anonymous** (ə-non′ə-məs), *adj.* (١) بێ ناو؛ ناو نەناسراو؛ کەس نەناس؛ کەس نەزان (ناو) (٢) ناوی نووسەرەکەی نەزانراوە یا بۆ بڵاوکردنەوە نییە (هەڵبەست، هۆنراوە، نامە بۆ ڕۆژنامەیەك... هتد):
*( an ~ poem, book, letter, etc.)*

**anopheles** (ə-nof′ə-lēz′), *n.* مێشوولەی لەرزوتا؛ مێشوولەی مەلاریا.

**anosmia** (an-os′mi-ə), *n.* نەمانی هەستی بۆن کردن (نەخۆشی)

**another** (ə-nuth′ēr), *adj. & prep.* (١) یەکێکی تر؛ دانەیەکی تری هەمان چەشن؛ تر؛ هی تر. (٢) یەکێکی جیاواز؛ دانەیەکی جیاواز.
(٣) یەکێکی هەمان چەشن.

**anoxemia** (an′ok-sē′mi-ə), *n.* کەمی ئۆکسجین لە خوێندا.

**answer** (an′sēr), *n.* (١) وەڵام
(٢) تۆڵە؛ وەڵام *( His ~ was a well-aimed blow.)* .
(٣) چارەسەر
*v.i.* (١) وەڵام دانەوە (٢) باش بوون؛ بەکارهاتن؛ گونجان.
(٣) ( to ~ )، بەرپرسیاربوون: *( He must ~ to the committee.)* .
(٤) لێکچوون؛ وەك یەك وابوون *( He ~s to the description.)* .
*v.t.* (١) وەڵام دانەوە
(٢) باش بوون بۆ؛ گونجان: *( The tent ~ed their purpose.)* .
(٣) بژاردن؛ هەق لێکرانەوە؛ پەشیمان بوونەوە؛ سزای خۆ چەشتن.
(٤) بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.
(٥) لێکچوون؛ وەك یەك وابوون: *( He ~s the description.)* .
**answer back, [Colloq.],** بەرپەرچدانەوە؛ قسە پێ ووتنەوە؛ لێ هەڵگەڕانەوە.
**answer for,** (١) بەرپرسیاربوون:
*( I can't answer for him.)*
(٢) هەق لێکرانەوە؛ ناخۆشی چەشتن:
*( You will have to answer for your wrongdoings one day.)*

**answerable** (an′sēr-ə-b'l), *adj.* (١) بەرپرسیارە؛ بەرپرسیار؛ لێی دەپرسرێتەوە: *( He is ~ to his boss.)* .
(٢) (أ) وەڵام دەدرێتەوە. (ب) بەرپەرچ دەدرێتەوە.
(٣) [Archaic]، ( to ~ )، شیاو؛ گونجاو؛ لەیەکچوو.

**ant** (ant), *n.* مێروولە.

**ant-** (ant), = **anti-**

**anta** (an′tə), *n.* کۆڵەکەی ڕاڕەوی بەردەرگا.

**antacid** (ant-as′id), *adj.* دژ بە ترشی؛ ترشی کوژ؛ ترشی مرێن.
*n.* دەرمانی دژ بە ترشی؛ دەرمانی ترشی کوژ یا ترشی مرێن.

**antagonism** (an-tag′ə-niz'm), *n.* (١) دوژمنایەتی؛ قینەبەرایەتی؛ دووبەرەکێتی؛ ناحەزی. (٢) دژایەتی؛ ناکۆکی؛ دژواری.

**antagonist** (an-tag′ə-nist), *n.* دوژمن؛ ناحەز؛ هاوچاو؛ دژوار.

**antagonistic** (an-tag′ə-nis′tik), *adj.* دوژمنانە؛ ناحەزانە؛ ناحەز: *( his ~ attitude)* .
**-antagonistically** *(adv.).*

**antagonize** (an-tag′ə-nīz′), *v.t.* (١) بەربەرەکانی کردن؛ بەرهەڵستی کردن؛ دژ وەستان. (٢) دوژمنایەتی لەگەڵ کردن؛ کردن بە دوژمن.

**antarctic** (ant-ärk′tik), *adj.* تایبەتی بە تەوەری باشووری زەوی.
*n.* تەوەری باشووری زەوی.

**Antarctica** (ant-ärk′ti-kə), *n.* ئەنتارکتیکا: ناوچەیەکی سەهۆڵبەندانە لە دەورپشتی تەوەری باشووری زەوی.

**Antarctic Circle, antarctic circle,** بازنەی تەوەری باشووری زەوی.

**ante** (an′ti), *n.* (١) ئەو پارەیەی قومارچی یاری " پۆکەر " پێش دابەش کردنی کاتی یاری یا پێش ڕاکێشانی کارتی تر دایدەنێت.
(٢) [Slang]، پێشەکی؛ پارەی پێشەکی دراو؛ بەشی خۆ کە پێشەکی دەدرێت
*v.t.* (١) دانانی ئەو پارەیەی قومار یا یاری لەسەر دەکرێت.
(٢) [Slang]، ( ~ up )، پێشەکی بەشی خۆ دان.

**ante-** (an′ti, an′tə), پێشگرێکە بەمانای: (١) لەپێش (کات)؛ پێش:
*(antecedent ; anteVictorian)*
(٢) پێش (جێگە)؛ بەردەم: *(anteroom)* .

**anteater** (ant′ēt′ēr), *n.* مێروولەخۆر.

**antecede** (an′tə-sēd′), *v.t. & v.i.* لەپێشتردا هاتن (پلە، جێگە، کات)؛ پێشتربوون لە.

**antecedence** (an′tə-sēd′'ns), *n.* لەپێشتردا هاتن؛ پێشتربوون لە؛ پێشتری.

**antecedency** (an′tə-sēd′'n-si), *n.* = **antecedence.**

**antecedent** (an′tə-sēd′'nt), *adj.* پێشین؛ پێشوو؛ هی پێشتر.
*n.* (١) شتی پێشتر؛ ڕووداوێکی لەپێشتر.
(٢) (*pl.*)، ڕابوردووی مرۆڤێك؛ باووباپیر.
(٣) ووشەی پێش ڕاناو کە ڕاناوی بۆ دەگەڕێتەوە (ڕێزمان).
(لە ڕستەی " **The man who came is my friend.** " دا ووشەی " **man** " پێی دەووترێت: " **antecedent** " ی " **who** " ).
(٤) بەشی یەکەمی ڕێژە یا کەرتێك (بیرکاری).
(٥) بەشی مەرجی کێشە (ژیربێژی).

**antechamber** (an′ti-chām′bēr), *n.* ژوورێکی بچووکە کە لێوەی دەچێت بۆ ژوورێکی گەورەترو گرنگتر لە خۆی؛ ژووری بەردەم.

**antedate** (an′ti-dāt′), ***v.t.*** (١) لەپێشتردا بوون یا ڕوودان؛ کۆنتربوون لە: ***( Christianity ~s Islam.)*** .
(٢) بەروار پێشخستن.
(٣) بەروارێکی زووتر بۆ دانان لە هی ڕاستی.
***n.*** [Rare], بەروارێکی زووتر لە هی ڕاستی.
**antediluvian** (an′ti-di-lōō′vi-ən), ***adj.*** (١) بەر لە لافاوەکەی نووح (٢) زۆر کۆن؛ کۆنباو.
**antelope** (an′t′l-ōp′), ***n.*** (١) ئاسکەکێوی؛ بزنەکێوی.
(٢) چەرمی ئاسکەکێوی.
**antemeridian** (an′ti-mə-rid′i-ən), ***adj.*** پێش نیوەڕۆ
**antemortem** (an′ti-môr′təm), ***adj.*** پێش مردن
**antemundane** (an′ti-mun′dān), ***adj.*** پێش دروستبوونی جیهان.
**antenatal** (an′ti-nā′t′l), ***adj.*** پێش لەدایکبوون؛ کاتی ئاولەمەیی.
**antenna** (an-ten′ə), ***n.*** (١) شاخی هەستیاری لە مێش‌ومەگەزدا.
(٢) هەوایی (رادیۆ و تەلەفزیۆن).
**antepenult** (an′ti-pē′nəlt), ***n.*** سێیەم برگەی ووشەیەك لە کۆتاییی ووشەکەوە (وەك برگەی " te " لەم ووشەیە خۆیدا).
**antepenultimate** (an′ti-pi-nul′tə-mit), ***adj.*** دوو دانە پێش دواهەمین؛ سێیەم لە کۆتاییەوە.
***n.*** (١) antepenult . (٢) شتێکی سێیەم لە کۆتاییەوە.
**anterior** (an-têr′i-ēr), ***adj.*** (١) لەپێشەوە (جێگە)؛ پێش.
(٢) لەپێشتردا (کات)؛ زووتر.
**anteroom** (an′ti-rōōm′, an′ti-room′), ***n.*** ژووری چاوەڕێ‌کردن؛ ژوورێکە کە دەچێت بۆ ژوورێکی تر.
**anthelmintic** (an′thel-min′tik), ***adj.*** کرمی ناوسك کوژ یا فڕێدەر.
***n.*** دەرمانی کرمی ناوسك کوژ یا فڕێدەر.
**anthem** (an′thəm), ***n.*** (١) سروودی ئاینی.
(٢) سروودی نیشتمانی: ***( national ~ )*** .
(٣) سروودی ستایشی؛ سروود.
**anther** (an′thēr), ***n.*** ئەو بەشەی نێرەك کە توّوی تێدایە (ڕووەکناسی).
**ant hill,** گردۆلکەی دەوری شارە مێرووله؛ شارە مێرووله.
**antho-** (an′thō, an′thə), پێشگرێکە بەمانای: گوڵ.
**anthology** (an-thol′ə-ji), ***n.*** ڕێکخەرو بلاوکەرەوەی هەڵبژاردەیەکی هەڵبەست، هونراوە، یا چیرۆك.
**anthologize** (an-thol′ə-jīz′), ***v.t.*** ڕێکخستن‌و بلاوکردنەوەی هەڵبژاردەیەکی ویژەیی.
**anthology** (an-thol′ə-ji), ***n.*** هەڵبژاردەیەکی ویژەیی.
**anthracite** (an′thrə-sīt′), ***n.*** خەڵووزێکی ڕەقە گەرمییەکی زۆر دەدات‌و دووکەڵی کەمە.
**anthrax** (an′thraks), ***n.*** (١) دوومەڵ؛ موو.
(٢) نەخۆشییەکی کوشندەی ئاژەڵە هەندێك جاریش تووشی مرۆڤ دەبێت.
**anthropo-** (an′thrə-pō, an′thrə-pə), پێشگرێکە بەمانای: مرۆڤ؛ ئادەمیزاد: ***(anthropology)*** .
**anthropocentric** (an′thrə-pə-sen′trik), ***adj.*** مرۆڤ دانەر بە گرنگترین شت‌و دوا ئامانجی جیهان.
**anthropogenesis** (an′thrə-pə-jen′ə-sis), ***n.*** زانستی پەیدا-بوونی مرۆڤ‌و بارگۆڕینی.
**anthropography** (an′thrə-pog′rə-fi), ***n.*** زانستی دابەش-بوونی مرۆڤ بەپێی تایبەتخۆو زمان‌و خووونەریتەوە.
**anthropoid** (an′thrə-poid′), ***adj.*** لە مرۆڤ چوو (بەتایبەتی مەیموونی وەك شمپانزی‌و گۆریلاو ئۆرانگەتان).
***n.*** مەیموونی لە مرۆڤ چوو.
**anthropologist** (an′thrə-pol′ə-jist), ***n.*** زانای مرۆڤ؛ مرۆڤناس؛ زانای مرۆڤناسی.
**anthropology** (an′thrə-pol′ə-ji), ***n.*** مرۆڤناسی؛ زانستی- پەیدابوون‌و بارگۆڕین‌و تایبەتخۆو نەریت‌و دابەشبوونی مرۆڤ.
-anthropological ***(adj.)***.
**anthropometry** (an′thrə-pom′ə-tri), ***n.*** زانستی پێوانی لەشی مرۆڤ بۆ بڕیاردانی جیاوازی ڕەگەزی (بەشێکە لە مرۆڤناسی).
**anthropomorphic** (an′thrə-pə-môr′fik), ***adj.*** تایبەتی بە مرۆڤ؛ هی مرۆڤ؛ وەك مرۆڤ لێکراو.
**anthropomorphism** (an′thrə-pə-môr′fiz′m), ***n.*** دانانی خواو گیاندارو شت بە ئادەمیزادو تایبەتخۆی ئادەمیزادانە دانەپاڵیان؛ وەك مرۆڤ سەیرکردنی خواو گیاندارو شت.
**anthropomorphize** (an′thrə-pə-môr′fīz), ***v.t. & v.i.*** بە-مرۆڤ دانانی شت؛ تایبەتخۆی مرۆڤ دانەپاڵ خواو گیاندارو شت.
**anthropomorphosis** (an′thrə-pə-môr′fə-sis), ***n.*** گۆڕین بۆ شێوەی ئادەمیزاد.
**anthropomorphous** (an′thrə-pə-môr′fəs), ***adj.*** لە مرۆڤ دەچێت.
**anthropophagi** (an′thrə-pof′ə-jī′), ***n.pl.*** پیاوخۆران؛ مرۆڤی خۆخۆر.
-anthropophagic ***(adj.)***.
**anthropophagous** (an′thrə-pof′ə-gəs), ***adj.*** مرۆڤی خۆخۆر؛ گۆشتی مرۆڤ خۆر؛ مرۆڤی پیاوخۆر.
**anthropophagy** (an′thrə-pof′ə-ji), ***n.*** خۆخۆری (مرۆڤ)؛ گۆشتی مرۆڤ خۆری.
**anti** (an′tī, an′ti), ***n.*** [Colloq.], مرۆڤی دژ بە.
***adj.*** [Colloq.], دژ بە.
**anti-** (an′ti), پێشگرێکە بەمانای: (١) دژ بە؛ دوژمن بە: ***(anti- imperialist)***
(٢) دژکار: ***(anti- aircraft)*** .
(٣) – کوژ؛ – بڕ؛ – مرێن: ***(anti- toxin)*** .
(٤) پێچەوانە. (٥) هاوچاو.
**antiaircraft** (an′ti-âr′kraft, an′ti-âr′kräft), ***adj.*** فڕۆکە-شکێن.
**antibacterial** (an′ti-bak-têr′i-əl), ***adj.*** بەکتریاکوژ؛ میکرۆب کوژ؛ دژ بە بەکتریا.
**antibiosis** (an′ti-bī-ō′sis), ***n.*** دژایەتی نێوان زیندەوەری گەردبینی کە دەبێتە هۆی فەوتاندنی یەکێکیان.
**antibiotic** (an′ti-bī-ot′ik), ***adj.*** (١) میکرۆب کوژ؛ بەکتریاکوژ؛ تایبەتی بە زیندەدژ. (٢) تایبەتی بە دەرمانی میکرۆب کوژ یا بەکتریاکوژ.
(٣) تایبەتی بە دژایەتی نێوان زیندەوەری گەردبینی کە زیانبەخشی یەکێکیانە.
***n.*** دەرمانی میکرۆب کوژ؛ زیندەدژ؛ بەکتریاکوژ.
**antibody** (an′ti-bod′i), ***n.*** پرۆتینێکە لەش دەریدەدات بۆ پاراستنی؛ دژەتەن؛ زیندەدژ؛ دژە ژیان.
**antic** (an′tik), ***adj.*** ئەنتیکە؛ سەیر؛ قۆشمە.
***n.*** (١) کردەوەیەکی ئەنتیکە، سەیر، یا قۆشمە؛ گاڵتەوگەپ.
(٢) [Archaic]، قۆشمەباز؛ قۆشمەچی.
**anticatalyst** (an′ti-kat′′l-ist), ***n.*** ماددەیەکە کارلێکردنی کیمیایی دوادەخات.
**antichrist** (an′ti-krīst′), ***n.*** (١) عیسا نەناس؛ دژ بە عیسا
(٢) عیسای درۆ.
**anticipate** (an-tis′ə-pāt′), ***v.t.*** (١) بەتەمابوون؛ چاوەڕوان کردن؛ ڕابینین. (٢) ڕوودان زووتر لە کاتی خۆی.
(٣) ڕێ لێگرتن؛ وەستاندن؛ بەرهەڵستی کردن (بە زانینی ڕوودانی شتێك پێش ڕوودانی: ***( He ~d his opponent's blows.)*** .
(٤) پێشەکی بینین یا هەستپێکردن‌و بەگوێرەی ئەوە ڕەفتارکردن:

***( The servant ~d his master's request.)***
(٥) دەستپێشکەری کردن.
(٦) دانەوەی قەرز لەپێش کاتی خۆیدا.
**anticipation** (an-tis´ə-pā′shən), ***n.*** (١) ڕابینین؛ بەتەمابوون؛ چاوەڕوان کردن؛ ئومێدەواری. (٢) شتێکی چاوەڕوان کراو یا بەتەمابوو.
(٣) دڵ خەبەردان؛ پێشەکی زانین.
(٤) دەستپێشکەری.
**anticipative** (an-tis′ə-pā´tiv), ***adj.*** تایبەتی بە بەتەمابوون یا ڕابینین.
**-anticipatory** ***(adj.).***
**anticlerical** (an´ti-kler′i-k'l), ***adj.*** دژ بە قەشەو دەسەڵاتو دەست خستنیانە ناو کاروباری گشتی‌یەوە.
**-anticlericalism** ***(n.).***
**anticlimactic** (an´ti-klī-mak′tik), ***adj.*** تایبەتی بە نزم-بوونەوەی کوتوپڕی لە باس، بیروڕا، یا کردارێکی بەرزەوە بۆ نزمو بێ بایەخ.
**anticlimax** (an´ti-klī′maks), ***n.*** نزم بوونەوەی کوتوپڕی لە باس، بیروڕا، یا کردارێکی بەرزەوە بۆ نزمو بێ بایەخ (بە پێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەڕوان دەکرا)
**antidote** (an′ti-dōt´), ***n.*** (١) دەرمانی ژەهر؛ دژ بە ژەهر؛ ژەهر ڕەوێن. (٢) خەم ڕەوێن؛ شتێك کە دەرمانی ناخۆشی‌و کارەساتو خەمو خەفەتە.
**-antidotal** ***(adj.).***
**antifebrile** (an′ti-fē′brəl, an´ti-feb′rəl), ***adj. & n.*** دەرمانی تا.
**antifreeze** (an′ti-frēz´), ***n.*** ماددەیەکە ناهێڵێت شلە بیبەستێت (بەتایبەتی بۆ ڕادیەتەری ئوتومبیل لە زستاندا).
**antigen** (an′tə-jən, an′tə-jin), ***n.*** دەرمانی لەش پارێز؛ دەرمانێکە کە کرایە ناو خوێنەوە ماددەی دژەتەن پەیدا دەکاتو بەرهەڵستی دەدات بە لەش
**antihistamine** (an´ti-his′tə-mēn´), ***n.*** دەرمانی تەنگەنەفەسی‌و هەستیاری
**anti-imperialist** (an´ti-im-pêr′i-əl-ist), ***n.*** کەسێکی دوژمن بە ئیمپریالیزم
**antiknock** (an′ti-nok´), ***n.*** ماددەی دژ بە تەقەتەق (دەکرێتە ناو بەنزینی ئوتومبیلەوە).
**antilabor** (an′ti-lā´bēr), ***adj.*** دژ بە یەکێتی کرێکاران.
**antimony** (an′tə-mō´ni), ***n.*** ئەنتیمۆن. ماددەیەکی کانزایی‌یە لە داڕشتەدا بەکاردەهێنرێت؛ کل (چاوڕشتن).
**antinomy** (an-tin′ə-mi), ***n.*** (١) نەگونجانی دوو یاسا یا پەیڕەو (٢) ناکۆکی نێوان دوو یاسا یا پەیڕەو. (٢) ناکۆکی؛ نەگونجان.
**antipathetic** (an´ti-pə-thet′ik), ***adj.*** (١) دژ بە؛ حەزلێنەکەر؛ ڕق لێ بوو؛ ناحەز: ***( ~ to new ideas)*** .
(٢) ڕق هەڵسێنەر؛ مایەی قێزە.
**-antipathetical** ***(adj.).***
**antipathy** (an-tip′ə-thi), ***n.*** (١) قین لێ بوون؛ ڕق لێ بوون؛ قین؛ حەزلێنەکردن؛ دژێتی بەرامبەر؛ قێز: ***( his ~ to violence)*** .
(٢) کەسێك یا شتێکی حەزلێنەکراو یا ڕق لێ بوو.
**antipersonnel** (an´ti-pēr-sə-nel′), ***adj.*** بۆ لەناوبردنی مرۆڤە نەك شتومەك (مین، بۆمبا)؛ دژە مرۆڤ: ***( ~ mines)*** .
**antiphon** (an′tə-fon´), ***n.*** (١) سروودی ئاینی؛ تەراویح.
(٢) گۆرانی بە نۆرە؛ بۆ سەندنەوە (گۆرانی)؛ وەڵام (ئاواز، گۆرانی).
**antiphony** (an-tif′ə-ni), ***n.*** (١) یەك ئاوازی چەند دەنگێك؛ ئاوازسازی (٢) سروودی ئاینی؛ بۆ سەندنەوەی گۆرانی.
(٣) دەنگدانەوە؛ وەڵام (ئاواز، گۆرانی).
**antipodal** (an-tip′ə-d'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە دیوی بەرامبەر لەسەر گۆی زەوی. (٢) پێچەوانە؛ پێچەوانەیی.
**antipode** (an′ti-pōd´), ***n.*** پێچەوانە.
**antipodes** (an-tip′ə-dēz´), ***n.pl.*** (١) دوو جێگەی بەرامبەر لەسەر زەوی. (٢) [A-]، ئوستورالیا و نیوزیلەندە.
(٣) دوو شتی پێچەوانەی یەکتر. (٤) پێچەوانە.
(٥) [Obs.]، خەڵکی ئەوپەڕی جیهان.
**antiquarian** (an´ti-kwâr′i-ən), ***adj.*** (١) تایبەتی بە کۆن؛ کۆن. (٢) تایبەتی بە پەڕتووکی کۆنو نایاب کۆکردنەوەو فرۆشتن.
(٣) تایبەتی بە کۆن ناسان؛ تایبەتی بە زانستی کۆن.
***n.*** کۆنناس؛ کۆنەفرۆش.
**antiquary** (an′ti-kwer´i), ***n.*** کۆنناس؛ کۆنەکۆکەرەوە؛ کۆنەفرۆش.
**antiquate** (an′ti-kwāt´), ***v.t.*** (١) کۆن کردن؛ باو نەهێشتن.
(٢) ڕووخسارێکی کۆن پێدان.
**antiquated** (an′ti-kwāt´id), ***adj.*** (١) کۆن؛ پیر.
(٢) باو نەماو؛ بەسەرچوو؛ کۆن: ***( ~ laws, methods, etc.)*** .
**antique** (an-tēk′), ***adj.*** (١) کۆن. (٢) باو نەماو؛ باو بەسەرچوو.
(٣) تایبەتی بە یۆنانو ڕۆمانی کۆن؛ تایبەتی بە شێوازی کلاسیکی.
(٤) لەسەر شێوازی چەرخێکی ڕابوردوو.
***n.*** (١) کۆنە؛ شتێکی لە کۆنەوە بەجێماو.
(٢) شێوازی کلاسیکی، واتە کۆن، بەتایبەتی لە خانووسازی‌و پەیکەرتاشیدا.
(٣) ئەنتیکە؛ شتێکی ئەنتیکە یا کۆنە (بەتایبەتی شتی ناوماڵ)؛ کۆنە.
(٤) تیپی تۆخو ڕەش (چاپەمەنی).
**antiquity** (an-tik′wə-ti), ***n.*** (١) زەمانی کۆن (بەتایبەتی پێش سەدەی ناوەڕاست)؛ زەمانی زوو؛ چەرخی کۆن؛ دێرین. (٢) کۆنێتی.
(٣) خەڵکی زەمانی کۆن (بەتایبەتی نووسەران).
(٤) (*pl.*)، کۆنە؛ کەلەپوورێکی زۆر کۆن.
(٥) (*pl.*)، خوو و نەریتی کۆن.
**antirust** (an´ti-rust′), ***adj.*** (١) ژەنگبڕ؛ دژ بە ژەنگ.
(٢) ژەنگ نەگر.
***n.*** ماددەی دژ بە ژەنگ (ڕادیەتەری ئوتومبیل).
**anti-Semite** (an´ti-sem′īt), ***n.*** کەسێکی دژ بە جوولەکە.
**-anti-Semitic** ***(adj.)***; **anti-Semitism** ***(n.).***
**antisepsis** (an´ti-sep′sis), ***n.*** بەکارهێنانی دەرمان بۆ پاکردنەوە لە بەکتریا و میکرۆب؛ پاکردنەوە.
**antiseptic** (an´ti-sep′tik), ***adj.*** (١) بەکتریا و میکرۆب کوژ؛ بۆگەنی‌و پیسی بڕ. (٢) پاك؛ خاوێن.
(٣) ووشكو توندوتیژو ناخۆش (باری ژیان).
**antisepticize** (an´ti-sep′tə-sīz´), ***v.t.*** پاکردنەوە لە بەکتریا و میکرۆب بە دەرمان.
**antiserum** (an´ti-sêr′əm), ***n.*** دەرمانی دژ بە بەکتریا (پزیشکەوانی).
**antislavery** (an´ti-slāv′ēr-i), ***adj.*** دژی بەندایەتی: ***( ~ laws)*** .
**antisocial** (an´ti-sō′shəl), ***adj.*** (١) دوورەپەرێز؛ گۆشەگیر.
(٢) دژ بە کۆمەڵ؛ دژ بە سوودی گشتی.
**antistrophe** (an-tis′trə-fi), ***n.*** (١) بۆ سەندنەوەی کۆرەس لە شانۆگەری یۆنانی کۆندا. (٢) بەشی دووەمی هەڵبەستێك کە وەڵامە بۆ بەشی یەکەم.
**antitank** (an′ti-taŋk´), ***adj.*** دژە دەبابە؛ دەبابە شکێن.
**antithesis** (an-tith′ə-sis), ***n.*** (١) بەراووردی یا پێچەوانەیی بیر لە دوو ڕستەدا: ***( You are going. ; I am staying. )*** .
(٢) بەشی دووەمی ووتەیەکی وەها (ژمارە یەك ببینە).
(٣) بەراووردی؛ جیاوازی؛ ناکۆکی.
(٤) دژ؛ پێچەوانە: ***( Joy is the ~ of sorrow.)*** .
**antithetic** (an´ti-thet′ik), ***adj.*** (١) بەرامبەر؛ جیاواز.
(٢) پێچەوانەی دەقاودەق؛ دژ.
**-antithetical** ***(adj.).***
**antitoxin** (an´ti-tok′sin), ***n.*** (١) ژەهر ڕەوێن (کە لەناو لەش خۆیدا

دروست دەبێت)؛ دژە ژەهر (٢) دەرمانی ژەهر ڕەوێن (کە بەرهەڵستی دەدات بە لەش دژی نەخۆشی وەناق، دەردەکۆیان... هتد).

**antitrust** (an´ti-trust′), *adj.* دژ بە قۆرخ کردنی بازرگانی و پیشەسازی.

**antiwar** (an′ti-wôr´), *adj.* دژ بە جەنگ؛ دژی شەڕ

**antler** (ant′lẽr), *n.* (١) شاخی پەل پەلی کەڵەکێوی. (٢) پەلێکی ئەم شاخە.

**ant lion,** (١) جانەوەرێکە کرمۆکەی مێرووله دەخوات. (٢) کرمۆکەی ئەم جانەوەرە

**antonym** (an′tə-nim´), *n.* ووشەی دژواتا

*( "Sad" is the ~ of "happy". )*

**antonymous** (an-ton′i-məs), *adj.* دژواتا.

**antrorse** (an-trôrs′), *adj.* بۆ سەرەوە یا پێشەوە هەڵچوو (ڕووەک- ناسی).

**antrum** (an′trəm), *n.* (١) بۆشایی ئێسقانی لەش (بەتایبەتی دوو بۆشایییەکەی نێوان لووت و کاژێری سەروو. (٢) بۆشایی؛ کلۆر.

**anuran** (ə-nū′rən), *adj. & n.* تایبەتی بە گیانداری تەڕو ووشکی بێ کلك (وەك بۆق و قورناویلکە).

**anurous** (ə-nū′rəs), *adj.* بێ کلك (بۆق، قورناویلکە).

**anus** (ā′nəs), *n.* کۆم؛ کونی قنگ؛ قنگ.

**anvil** (an′vil), *n.* (١) دەسگا؛ دەزگا: مێخ سندان. (٢) یەکێکە لە سێ ئێسقانەکەی گوێی ناوەوە.

**anxiety** (aŋ-zī′ə-ti), *n.* (١) مەراق؛ دڵەڕاوکێ؛ بێ ئارامی؛ خەم. (٢) هۆی ئەم مەراقە (شت، بیر). (٣) بە پەرۆشەوە بوون؛ پەرۆش: *( ~ to do well)* .

**anxious** (aŋk′shəs, aŋ′shəs), *adj.* (١) مەراقدار؛ بێ ئارام. (٢) مایەی مەراق و بێ ئارامییە. (٣) بەپەرۆش؛ ئاواتەخواز؛ بەتاسەوە:

*( I am ~ to go home and see my family.)*

**-anxiousness** *(n.).*

**anxiously** (aŋk′shəs-li, aŋ′shəs-li), *adj.* بەپەرۆشەوە؛ بێ سرەوتانەو بەتاسەوە *( I am waiting ~ for you.)* .

**any** (en′i), *adj.* (١) هەر؛ هەرچ؛ هەر کامێکیان: *( A~ boy may go.)* . (٢) هەندێك؛ هیچ *( Do you have ~ apples?)* . (٣) هیچ؛ هیچ شتێك: *( I haven't ~ money.)* . (٤) هەموو؛ هەمووکەس *( A~ child can tell.)* .

*pron.* (sing. & pl.), هەرکەس؛ هەرچەندێك.

*adv.* تا هیچ ڕادەیەك؛ هیچ (پرسیار):

*( Is he ~ better this morning?)*

**anybody** (en′i-bud´i, en′i-bod´i), *pron.* (١) هەرکەس؛ هەرچ کەسێك. (٢) کەسێکی بەناوبانگ یا ناسراو.

**anyhow** (en′i-hou´), *adv.* (١) هەرچۆنێك بێت؛ بە هەرجۆرێك بێت. (٢) بە لامسەرلایی

**anyone** (en′i-wun´), *pron.* هەرکەس؛ هەرچ کەسێك

**any one,** (١) هەریەکێك؛ هەردانەیەك. (٢) هەر تاکەکەسێك؛ هەردانەیەك.

**anything** (en′i-thiŋ´), *pron.* هەرشتێك؛ هەر کارێك یا ڕووداوێك.

*n.* شتێك؛ هەرشتێك

*adv.* تا هەر ڕادەیەك؛ هیچ؛ هەرچەندێك بێت.

**anything but,** هیچ؛ بە هیچ جۆرێك؛ هەرگیز.

*( He is anything but kind.)*

**anyway** (en′i-wā´), *adv.* (١) بە هەرجۆرێك بێت؛ هەرچۆنێك بێت؛ بە هەرحاڵ. (٢) هیچ نەبێت؛ لەگەڵ ئەوەشدا. (٣) بە لامسەرلایی.

**anyways** (en′i-wāz´), *adv.* [Colloq.]. = anyway.

**anywhere** (en′i-hwâr´), *adv.* (١) لە هەرشوێنێك؛ بۆ هەرجێیەك بێت. (٢) [Colloq.]، تا هەر ڕادەیەك؛ هەرچەندێك بێت.

**anywhere from, [Colloq.],** لەنێوان (دوو کات، ژمارە، هەند):

*( It costs anywhere from five to ten dollars. ; It takes anywhere from one to two hours.)*

**get anywhere, [Colloq.],** هیچ سەرکەوتنێك هێنانەدی.

**anywise** (en′i-wīz´, *adv.* هەرچۆنێك بێت؛ بە هەرجۆرێك بێت.

**apace** (ə-pās′), *adv.* خێرا؛ بە خێرایی.

**Apache** (ə-pach′i), *n.* (١) ئەپاچی: تیرەیەکی هیندی سووری خواروی ڕۆژاوای ئەمەریکا و سەرووی مەکسیکە. (٢) ئەندامێکی ئەم تیرەیە. (٣) یەکێك لە زمانەکانی ئەم تیرەیە

**apache** (ə-päsh′, ə-pash′), *n.* شەلاتی یا چەتەیەکی پاریس.

**apart** (ə-pärt′), *adv.* (١) لەلاوە. (٢) جیا (لە کات و شوێندا)؛ جیاواز. (٣) دوور لەیەکتر. (٤) بە جیا جیا؛ بە جیا: *( viewed ~ )* . (٥) پارچە پارچە.

*adj.* بە جیا؛ جیا؛ جیاواز.

**apart from,** جگە لە؛ بێجگە لە؛ لەوەیش بەولاوە.

**joking apart,** بێ گاڵتە.

**know apart,** لەیەك جیاکردنەوە (شت، مرۆڤ).

**live apart,** بە جیا ژیان؛ پێکەوە نەژیان.

**set apart,** خستنەلاوە؛ هەڵگرتن؛ پاشەکەوت کردن.

**take apart,** هەڵوەشاندن (مەکینە، بیروڕا)؛ پارچەپارچەکردن.

**apartheid** (ə-pärt′hīt), *n.* سیاسەتی ڕەگەزپەرستی دژ بە قوولە- ڕەشەکان لە باشووری ئەفەریقا.

**apartment** (ə-pärt′mənt), *n.* خانۆچکە؛ ئەپارتمان؛ دەستەخانوو.

**apartment house (or building),** خانوویەکە بەش بەش کراوە بە چەند خانۆچکەیەکەوە هەریەکەیان بە سەربەخۆ دەدرێن بە کرێ.

**apathetic** (ap´ə-thet′ik), *adj.* (١) بێ هەست؛ هەست مردوو. (٢) بێ دەربەست؛ بەتەنگەوە نەهاتوو؛ گوێ نەدەر؛ بێباك.

**apathetical** (ap´ə-thet′i-k'l), *adj.* = apathetic.

**-apathetically** *(adv.).*

**apathy** (ap′ə-thi), *n.* (١) بێ هەستی؛ هەست مردوویی. (٢) بێ دەربەستی؛ بەتەنگەوە نەهاتن؛ بێباکی؛ گوێ نەدان.

**ape** (āp), *n.* (١) مەیموون. (٢) لاساییکەرەوە.

*v.t.* لاسایی کردنەوە.

**apeak** (ə-pēk′), *adv.* بە ستوونی؛ بە قنجی؛ بە ڕەپی.

**aperient** (ə-pêr′i-ənt), *adj. & n.* دەرمانی ڕەوانی.

**aperiodic** (ā´pêr-i-od′ik), *adj.* بە چەرخی ڕێكوپێکی ڕوونەداو.

**aperitif** (a´pā´rē´tēf′), *n.* خواردنەوەیەکی کحوولییە.

**aperture** (ap′ẽr-chẽr), *n.* (١) کون؛ کەلەبەر. (٢) تیرەی چاوی کامێرا یا دووربین (کە ڕووناکی لێوە دەچێتە ژوورەوە).

**apery** (āp′ẽr-i), *n.* (١) لاسایی کردنەوە. (٢) لاسایی کردنەوەیەك.

**apex** (ā′peks), *n.* (١) لووتکە؛ پۆپ؛ سەر؛ تەوقەسەر. (٢) سەری زمان.

**aphasia** (ə-fā′zhə, ə-fā′zhi-ə), *n.* توانای قسەکردن و تێگەیشتن نەبوون (بەهۆی برینداری مێشکەوە).

**-aphasiac** *(n.)*; **aphasic** *(adj.).*

**aphelion** (a-fē′li-ən, ə-fē′li-ən), *n.* دوورترین خاڵی خولگەی ئەستێرەیەکی گەڕۆك لە خۆرەوە.

**aphesis** (af′ə-sis), *n.* لابردنی بڕگەیەکی کورتی بێ هێز لە سەرەتای ووشەدا (وەك: squire لەباتی esquire ) .

**aphid** (ā′fid, af′id), *n.* سن؛ جانەوەرێکی زۆر بچووکە دەداتە ڕووەك.

**aphis** (ā′fis, af′is), *n.* = aphid.

**aphonia** (ə-fō′ni-ə), *n.* دەنگ نووسان یا نەمان (بەهۆی نەخۆشی ژێ دەنگەکانەوە).

**aphonic** (ə-fon′ik), *adj.* (١) دەنگ نووساو یا نەماو.
(٢) بێ دەنگ (دەنگسازی).
**aphorism** (af′ə-riz′m), *n.* پەندی پێشینان؛ قسەی نەستەق.
**aphoristic** (af′ə-ris′tik), *adj.* (١) وەك پەندی پێشینان.
(٢) پڕ لە قسەی نەستەق.
**aphrodisiac** (af′rə-diz′i-ak′), *adj.* هەوەس هەڵسێنی جووت-بوون؛ هەوەس بزوێن (خواردەمەنی).
*n.* خواردەمەنی هەوەس هەڵسێن.
**Aphrodite** (af′rə-dī′ti), *n.* (١) بانوخوای دڵداری و جوانی یۆنانی (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) [a-]، جۆرە پەپوولەیەك.
**aphyllous** (ə-fil′əs), *n.* بێ گەڵا (وەك ڕووەکێکی بیابانیی هەمەجۆرە کە پێی دەوترێت: " کاکتەس " )؛ ڕووت.
**apian** (ā′pi-ən), *adj.* هەنگی؛ تایبەتی بە هەنگ.
**apiarian** (ā′pi-âr′i-ən), *adj.* تایبەتی بە هەنگ و بەخێوکردنی.
*n.* هەنگ بەخێوکەر.
**apiarist** (ā′pi-ə-rist), *n.* هەنگ بەخێوکەر.
**apiary** (ā′pi-er′i), *n.* پلوورە هەنگ خانە؛ شوێنی پلوورە هەنگ.
**apical** (ap′i-k′l, ā′pi-k′l), *adj.* (١) پۆپەیی؛ لووتکەیی.
(٢) بە سەری زمان بێژراو (دەنگسازی).
*n.* دەنگی تیپی بە سەری زمان بێژراو (وەك: t, d, s, l ).
**apiculture** (ā′pi-kul′chēr), *n.* هەنگ بەخێوکردن.
**apiece** (ə-pēs′), *adv.* هەریەکی؛ هەریەکەی؛ سەری:
*( We spent ten dollars ~ .)*
**apiology** (ā′pi-ol′ə-ji), *n.* هەنگناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوەی هەنگ.
**apish** (āp′ish), *adj.* (١) مەیموونانە. (٢) لاساییکەرەوە.
(٣) خۆدەرخەر؛ هاروهاج؛ فێڵباز.
**aplomb** (ə-plom′, ə-plôm′), *n.* بڕوا بە خۆ بوون؛ بە خۆدا ڕاپەڕموون؛ ژیری.
**apnea, apnoea** (ap-nē′ə), *n.* (١) هەناسەبڕانی کاتی.
(٢) لە هۆش خۆ چوون (لەبەر کەمیی ئۆکسجین)؛ خنکان.
**apo-** (ap′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) دوور لە؛ بەبێ.
(٢) جیا؛ پێکەوە نەنووساو.
**apocalypse** (ə-pok′ə-lips′), *n.* (١) دوا بەشی ئینجیل.
(٢) پێشبینی؛ دواڕۆژبینی؛ ئاشکراکردنی دواڕۆژ.
(٣) کارەساتێکی گەورەی دواڕۆژ.
**apocalyptic** (ə-pok′ə-lip′tik), *adj.* (١) تایبەتی بە دوا بەشی ئینجیل (٢) پێشبینی؛ دواڕۆژبینی
(٣) نیشانەی کارەساتێکی گەورەو بەم زووانەیە.
-apocalyptical *(adj.).*
**apocopate** (ə-pok′ə-pāt′), *v.t.* کورتکردنەوەی ووشە بە فووتدانی دوا برگە یا دوا دەنگ.
**apocope** (ə-pok′ə-pi′), *n.* فووتدانی دوا دەنگ، تیپ، یا برگەی ووشەیەك (وەك: mos لەباتی most ).
**apocrypha** (ə-pok′rə-fə), *n.* (١) نووسراوێکە کە گومان لە ڕاستێتی بکرێت یا نەزانرێت نووسەرەکەی کێیە.
(٢) [A-]، ئەو نووسراوانەی کە پرۆتستانتێییەکان بڕوا ناکەن بەشێك بن لە ئینجیلی کۆن.
**apod** (ap′əd), *adj.* بێ قاچ؛ بێ پەل.
*n.* گیاندارێکی بێ قاچ.
**apodal** (ap′ə-d′l), *adj.* بێ قاچ؛ بێ پەل
**apodeictic** (ap′ə-dīk′tik), *adj.* = apodictic.
**apodictic** (ap′ə-dik′tik), *adj.* بەڵگەدار (بیروڕا، فەلسەفە)؛ ڕاست؛ بێ گومان
**apodosis** (ə-pod′ə-sis), *n.* بەشی تەواوکەری ڕستەی مەرجی.
**apogamy** (ə-pog′ə-mi), *n.* زۆربوونی ڕووەك بەبێ لێکدان یا پیتاندن.
-apogamic *(adj.)*; apogamous *(adj.).*
**apogee** (ap′ə-jē′), *n.* (١) دوورترین خاڵی زەوی لە خولگەی مانگەوە.
(٢) دوورترین یا بەرزترین جێگە.
**Apollo** (ə-pol′ō), *n.* (١) ئەپۆلۆ: خودای مۆسیقا و هەڵبەست و پێشبینی و پزیشکەوانی و خۆر (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان).
(٢) کوڕێکی قۆز.
-Apollonian *(adj.).*
**Apollyon** (ə-pol′yən), *n.* شەیتان.
**apologetic** (ə-pol′ə-jet′ik), *adj.* (١) بووردنخواز.
(٢) لەسەرکەرەوە (بە نووسین یا دووان).
**apologetics** (ə-pol′ə-jet′iks), *n.pl.* لەسەرکردنەوەی خاچ-پەرستی (ئایینناسی).
**apologia** (ap′ə-lō′ji-ə), *n.* ووتارێکی لایەنگری یا لەسەرکەرەوە.
**apologist** (ə-pol′ə-jist), *n.* پشتیوانکەری بیروباوەڕ یا ڕێبازێك بە نووسین یا دووان؛ بەڵگە بۆ هێنەرەوە.
**apologize** (ə-pol′ə-jīz′), *v.i.* (١) داوای لێبووردن کردن؛ داوای لێخۆشبوون کردن" پاساو هێنانەوە:
*( He ~d to his teacher for coming to school late.)*
(٢) لایەنگری کردن یا لەسەرکردنەوە (بە نووسین یا دووان).
**apology** (ə-pol′ə-ji), *n.* (١) پاڵپشتی کردن یا لایەنگری کردنی ئاین، ڕێباز، یا بیروباوەڕێك (بە نووسین یا دووان)؛ ووتارێکی وەها
(٢) بووردنخوازی؛ داوای لێخۆشبوون کردن" پاساو" پاساو هێنانەوە:
*( If you are impolite to a person, you should make an ~ .)*
(٣) بریتییەکی قەڵب.
**apoplectic** (ap′ə-plek′tik), *adj.* (١) فێدار؛ فێی لێ دێت.
(٢) وەك فێ؛ دەبێتە هۆی فێ لێهاتن.
*n.* کەسێك کە فێی لەگەڵدا بێت.
**apoplexy** (ap′ə-plek′si), *n.* فێ.
**aport** (ə-pôrt′), *adv.* لای چەپی کەشتی؛ بۆ لای چەپ.
**apostasy** (ə-pos′tə-si), *n.* هەڵگەڕانەوە (لە ئاین، ڕێباز، بیروباوەڕ، حیزب)؛ لادان لە ڕێی ڕاست.
**apostate** (ə-pos′tāt, ə-pos′tit), *n.* کەسێکی هەڵگەڕاوە لە ئاین یا ڕێبازێك؛ گومڕا؛ لادەر.
**apostatize** (ə-pos′tə-tīz′), *v.i.* هەڵگەڕانەوە لە ئاین یا ڕێبازی خۆ.
**aposteriori** (ā′pos-têr′i-ôr′i), (١) لە ئەنجامەوە بۆ هۆ (فەلسەفە، ژیربێژی):
*( The boys are tired, so they must have walked a long way.)*
(٢) کردەنی؛ لەسەر تاقیکردنەوە و سەرنج دانراوە.
**apostil, apostille** (ə-pos′til), *n.* تێبینی سەر پەراوێز.
**apostle, Apostle** (ə-pos′'l), *n.* (١) [A-]، هەریەکێك لە دوانزە قوتابی یا پەیامبەرەکانی عیسا. (٢) پەیامبەر؛ پەیامبەری خاچ پەرستان؛ قوتابی. (٣) خاچ پەرست بڵاوکەرەوەیەکی کۆن.
(٤) ڕابەری ڕێبازێکی تازە؛ ڕابەر؛ سەرکردەیەکی سازاندنی کۆمەڵ.
**apostolate** (ə-pos′t'l-it, ə-pos′t'l-āt′), *n.* پلەو ئەرك و ماوەی کاری پەیامبەرێك.
**apostolic** (ap′əs-tol′ik), *adj.* (١) پەیامبەری؛ پێغەمبەری.
(٢) تایبەتی بە دوانزە قوتابی و پەیامبەرەکەی عیسا و کاروبار و ئامۆژگاری و چەرخی ژیانیان. (٣) [A-]، پاپایی؛ تایبەتی بە پاپا.
**Apostolic See,** تەختی پاپایی؛ پلەو دەسەڵات و کاری پاپا.
**apostrophe** (ə-pos′trə-fi), *n.* بانگ کردنی کەسێکی دیار یا نادیار لە ویژە و ووتاردا؛ بانگ.
**apostrophe** (ə-pos′trə-fi), *n.* نیشانەیەکە وەك وێرگول ( ' ) لە ڕێکی لاژووروی تیپەوە دادەنرێت بەم مانایانە:
(١) لە جێی تیپی لادراو: ( I'm = I am ).

(٢) نیشانەی بوونە: ( Mary's dress ; The girls' room ) .
(٢) نیشانەی کۆیە: ( five 6's ; the A's ) .
**apostrophize** (ɔ-pos'trə-fīz'), *v.t. & v.i.* بانگ کردنی کەسێکی دیار یا نادیار لە وێژەو ووتاردا:
*( "Million! thou should'st be living at this hour." )*
**apostrophize** (ə-pos'trə-fīz'), *v.t. & v.i.* بەکارهێنانی وێرگول.
**apothecary** (ə-poth'ə-ker'i), *n.* دەرمانگەر؛ دەرمانساز؛ دەرمانفرۆش.
**apothegm** (ap'ə-them'), *n. Also* apophthegm, پەندی- پێشینان؛ قسەی نەستەق.
**apotheosis** (ə-poth'i-ō'sis, ap'ɔ-thē'ə-sis), *n.* (١) کردن بە خودا؛ بەرزکردنەوەی مرۆڤێك بۆ پلەی خودا.
(٢) ستایش کردنێکی لە ڕادەبەدەری مرۆڤ یا شت.
(٣) نموونەی بەرز؛ وێنەی بەرز.
-apotheosize *(v.t.)*.
**appal** (ə-pôl'), *v.t.* = appall.
**appall** (ə-pôl'), *v.t.* تۆقاندن؛ ترساندن؛ زۆر سەرسام کردن؛ زراوبردن.
**appalling** (ə-pôl'iŋ), *adj.* ترسناك؛ تۆقێنەر؛ زۆر خراپ؛ ناپەسەند:
*( His behavior was ~ .)*
**appanage, apanage** (ap'ə-nij), *n.* (١) زەوی‌وزارو پارەیەك کە پاشاو میر دەیدەن بە منداڵەکانیان. (٢) بەخشیش؛ زیادەبەش.
(٣) مافێکی تایبەتی کەسێك بەهۆی پلەوپایەیەوە.
(٤) هەرێمێکی ژێردەستەی وڵاتێکی بێگانە.
**apparatus** (ap'ə-rā'təs, ap'ə-rat'əs), *n.* (١) کەرەسە؛ پێویستی کار. (٢) دەزگا؛ دام‌ودەزگا.
(٣) ئامێر؛ مەکینە. (٤) پێوانە؛ هۆی پێوانە یا کێشە.
(٥) کۆئەندام: *( the digestive ~ )* .
**apparel** (ə-par'əl), *n.* (١) جل؛ جل‌وبەرگ؛ پۆشاك.
(٢) بەرگی ڕازاندنەوە: *( the white ~ of winter)* .
(٣) پۆشاکی کەشتی (لەنگەر، تەوەر، تۆپ‌و دەزگای تری دەرەوە دەگرێتەوە).
*v.t.* پۆشین؛ بەرگ کردنەبەر.
**apparent** (ə-par'ənt, ə-pâr'ənt), *adj.* (١) دیار؛ لەبەرچاو.
(٢) ڕوون؛ ئاشکرا. (٣) لەوەچوو؛ وا دیاربوون؛ ڕوواڵەت.
**apparently** (ə-par'ənt-li, ɔ-pâr'ənt-li), *adv.* (١) بە ئاشکرا؛ لەبەرچاو. (٢) وا دیارە؛ لەوە دەچێت؛ وا دەردەکەوێت.
**apparition** (ap'ə-rish'ən), *n.* (١) شتێکی لەپڕ دەرکەوتوو.
(٢) خێو. (٣) هاتنەڕوو؛ هاتنەپێشەوە.
**apparitor** (ə-par'ə-tēr, ə-pâr'ə-tēr), *n.* فەرمانبەری بەجێهێنان یا پێ ڕاگەیاندنی فەرمانی دادگای ئاینی یا میری.
**appeal** (ə-pēl'), *v.t.* (١) [Archaic] ، تاوانبارکردن.
(٢) داوای پیاچوونەوەی بڕیاری دادگاکردن: *( to ~ a verdict)* .
*v.i.* (١) داوای پیاچوونەوەی بڕیاری دادگایی‌کردن.
(٢) ( to ~ )، تکاکردن؛ داواکردن؛ هاوار بۆ بردن؛ بانگ کردن:
*( She ~ed to him for mercy.)*
(٣) پەنابردنەبەر. (٤) بەدڵ بوون؛ دڵ ڕاکێشان:
*( His ideas ~ed to me. ; She ~s to me.)*
*n.* (١) بانگەواز؛ تکا؛ داواکردن؛ هاوار؛ بانگ؛ داوا:
*( an ~ to the government to release the political prisoners)*
(٢) (ا) داواکردن لە دادگا بۆ پیاچوونەوەی داواکاری‌یەك. (ب) ئەم داوایە.
(ج) مافی ئەم داواکردنە. (د) داواکاری‌یەکی دراو بە دادگایەکی بەرزتر.
(٣) جوانی؛ توانای دڵفڕاندن یا دڵ ڕاکێشان؛ برەو:
*( That kind of music has lost its ~ .)*
(٤) [Archaic]، تاوانبارکاری.
**appealable** (ə-pēl'ə-b'l), *adj.* (١) دەتوانرێت داوای پیاچوونەوەی بکرێت لەلایەن دادگایەکی بەرزترەوە. (٢) داوای پیاچوونەوەی دەکرێت (بڕیار).

**appear** (ə-pêr'), *v.i.* (١) هاتنە بەرچاو؛ هاتنەڕوو؛ دەرکەوتن.
(٢) پەیدابوون؛ سەرهەڵدان.
(٣) وا دەرکەوتن؛ وا دیاربوون؛ لەوەچوون:
*( It ~s that he will win the election.)*
(٤) چوونە دادگا؛ خۆ پیشاندان لە دادگادا:
*( He ~ed in court yesterday.)*
(٥) بڵاوکردنەوە (چاپەمەنی). (٦) نوواندن (شانۆگەری):
*( He will ~ in Hamlet.)*
**appearance** (ɔ-pêr'əns), *n.* (١) دەرکەوتن؛ هاتنەڕوو؛ پەیدابوون:
*( the ~ of flowers in the spring)*
(٢) ڕوو؛ ڕووخسار؛ ڕوواڵەت؛ دیمەن:
*( She has a nice ~ . ; A~s are sometimes deceiving.)*
(٣) شتێکی لەڕوو یا دیار. (٤) خێو.
(٥) وا پیشاندان؛ وا دەرخستن؛ وا نوواندن:
*( He gave the ~ of being busy.)*
**keep up appearances,** خۆ بە باشی پیشاندان؛ خۆ بە باشی نوواندن؛ ڕوواڵەتێکی پەسەند پیشاندان.
**make an appearance,** خۆ پیشانی خەڵك دان.
**put in an appearance,** چوونە کۆبوونەوە یا ئاهەنگێك بۆ ماوەیەکی کورت.
**appeasable** (ə-pēz'ə-b'l), *adj.* دڵی نەرم دەبێت یا نەرم دەکرێت؛ دەهێنرێتەوە سەرخۆ؛ هێمن دەکرێتەوە.
**appease** (ɔ-pēz'), *v.t.* (١) هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ دڵنەوایی کردن؛ هێنانەوە سەرخۆ.
(٢) تینوێتی شکاندن؛ تێرکردن: *( Water ~s thirst.)* .
(٣) ڕازی کردن یا دەمکوت کردنی دوژمن بە بەرتیل یا جێبەجێکردنی داوا نابەجێ‌یەکەی هەر بۆ ئەوەی شەڕ نەفرۆشێت؛ لاواندنەوەی دوژمنی دڕندە:
*( to ~ an enemy)*
**appeasement** (ɔ-pēz'mənt), *n.* ڕازی کردن یا دەمکوت کردنی دوژمن بە جێبەجێکردنی داواکەی؛ دڵ نەرم کردن؛ هێمن کردنەوە:
*( a policy of ~ )*
**appellant** (ə-pel'ənt), *adj.* تایبەتی بە پیاچوونەوەی داوای دادگایی کردن لەلایەن دادگایەکی بەرزترەوە.
*n.* دادخواز (لە دادگای پیاچوونەوە)؛ داواکاری پیاچوونەوە.
**appellate** (ɔ-pel'it), *adj.* تایبەتی بە پیاچوونەوە (دادگا).
**appellate court,** دادگای پیاچوونەوە.
**appellation** (ap'ə-lā'shən), *n.* (١) ناونان؛ ناولێنان.
(٢) ناو؛ ناونیشان؛ نازناو.
**appellative** (ə-pel'ɔ-tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە ناو.
(٢) تایبەتی بە ناوی گشتی (ڕێزمان).
*n.* (١) ناو؛ ناونیشان. (٢) ناوی گشتی (ڕێزمان).
**appellee** (ap'ə-lē'), *n.* داوا لەسەر یا شکات لێکراو لە دادگای پیاچوونەوەدا.
**appellor** (ə-pel'ôr, ap'ə-lôr), *n.* داواکار یا دادخواز لە دادگای پیاچوونەوەدا.
**append** (ə-pend'), *v.t.* پێوەنووساندن؛ کردن بە پاشکۆ؛ خستنەسەر.
**appendage** (ə-pen'dij), *n.* (١) پاشکۆ؛ کلك (مەجان)؛ زیادە.
(٢) ئەندامێکی ناسەرەکی لەش (کلك، لاق... هتد).
**appendant, appendent** (ə-pen'dənt), *adj.* (١) خراوەسەر؛ زیادە؛ کلك (مەجان)؛ پاشکۆ. (٢) تایبەتی بە مافی پاشکۆیەتی (دادگەری).
*n.* (١) پاشکۆ. (٢) مافی پاشکۆیەتی (دادگەری).
**appendectomy** (ap'ən-dek'tə-mi), *n.* دەرهێنان یا لابردنی ڕیخۆڵەکوێرە.
**appendices** (ə-pen'də-sēz'), *n. alternative plural of-* **appendix.**

**appendicitis** (ə-pen´də-sī′tis), *n.* هەوکردنی ڕیخۆڵەکوێرە.
**appendix** (ə-pen′diks), *n.* (١) پاشکۆ (بەرتووك)؛ کلك (مەجان). (٢) ڕیخۆڵەکوێرە.
**apperceive** (ap´ẽr-sēv′), *v.t.* لێکدانەوەو تێگەیشتنی شتی تازە بە شارەزایی کۆن
**apperception** (ap´ẽr-sep′shən), *n.* (١) ڕێ نەدیی؛ بینین یا هەستپێکردن (٢) تێگەیشتنی شتی تازە بە شارەزایی کۆن.
**appertain** (ap´ẽr-tān′), *v.i.* پەیوەندی پێوەبوون.
**appetence** (ap′ə-təns), *n.* = appetency.
**appetency** (ap′ə-tən-si), *n.* (١) حەز؛ ئارەزوو؛ بێزوو. (٢) ئارەزوو یا مەیلێکی زگماکی. (٣) هۆگری و مەیلی سرووشتی بۆ نزیک- بوونەوە لەیەك (لەنێوان شتی وەك كەرەسەی کیمیاییدا).
**appetite** (ap′ə-tīt´), *n.* (١) ئارەزوو؛ حەز (شت، کردار)؛ بێزوو. (٢) ئارەزووی خواردن؛ حەزی خواردن؛ دڵ بردن
**appetizer** (ap′ə-tīz´ẽr), *n.* بەرخۆراك؛ بەردڵکەرەوە؛ مەزە.
**appetizing** (ap′ə-tīz´iŋ), *adj.* (١) بەردڵکەرەوە؛ ئارەزووکەرەوە:
*( An ~ smell came from the kitchen.)*
(٢) خۆش (خواردەمەنی).
**applaud** (ə-plôd′), *v.t. & v.i.* (١) چەپڵە بۆ لێدان. (٢) پەسەندکردن؛ ئافەرین کردن.
**applause** (ə-plôz′), *n.* چەپڵە؛ چەپڵەڕێزان.
**apple** (ap′'l), *n.* (١) سێو (٢) دارسێو.
**apple of discord,** هۆی ناکۆکی و دووبەرەکی.
**apple of one's eye,** (١) بیلبیلەی چاو. (٢) کەسێك یا شتێکی زۆر خۆشەویست.
**apple polisher,** [Slang]. مەراییکەر؛ کوزکەش.
**applesauce** (ap′'l-sôs´), *n.* (١) شیرینییەکە لە سێو دەکرێت. (٢) [Slang]. قسەی هیچ وپووچ.
**appliance** (ə-plī′əns), *n.* (١) [Rare]. بەکارهێنان؛ بەکارهێنران. (٢) ئامێری ناومال؛ پێکاری ناومال: *( kitchen ~s)* .
**applicable** (ap′li-kə-b'l), *adj.* بەسەردا گونجاو؛ شیاو؛ پەیوەندیدار؛ کارپێکراو: *( The law is not ~ in this case.)* .
**-applicability** *(n.).*
**applicant** (ap′li-kənt), *n.* داواکار (کار، قوتابخانە، یارمەتی)؛ داخواز: *( There were fifty ~s for one job.)* .
**application** (ap´li-kā′shən), *n.* (١) بەکارهێنان؛ کارپێکردن؛ خستنەکار. (٢) لێدان (دەرمان، ئارایشت). (٣) دەرمان. (٤) شێوەی بەکارهێنان یا لێدان. (٥) داوا (کار، قوتابخانە، یارمەتی)؛ داخوازی؛ داوانامە:
*( an ~ for employment)*
(٦) داوانامە؛ ویستنامە؛ ئیستیمارە: *( to fill out an ~ )* .
(٧) کۆشش؛ هەوڵ وتەقەلا.
(٨) پەیوەندی؛ گرتنەوە: *( This idea has no ~ to the case.)* .
**applicative** (ap′li-kā´tiv), *adj.* بەکاردێت.
**applicator** (ap′li-kā´tēr), *n.* ئامێری دەرمان، بۆیە، یا شتی تر پێ لێدان؛ دلۆپێنەر؛ دلۆپێن.
**applicatory** (ap′li-kə-tôr´i, ap′li-kə-tō´ri), *adj.* کردەنی
**applied** (ə-plīd′), *adj.* کردەنی؛ کردارەکی؛ بەجێهێنەر؛ بەکاردەهێنرێت: *( ~ physics)* .
**appliqué** (ap′li-kā´), *adj.* پێوەدووراو (نەقشی ڕازاندنەوە).
*n.* نەقش یا پارچە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ کە دەدوورێت بە قوماشێکەوە بۆ ڕازاندنەوە.
*v.t.* ڕازاندنەوە (بە نەقش و پارچە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ).
**apply** (ə-plī′), *v.t.* (١) لێدان (بۆیە، دەرمان، کەتیرە):
*( A~ glue to the surface.)*
(٢) (ا) بەکارهێنان بۆ مەبەستێکی تایبەتی؛ لێدەرکردن:
*( A~ these ten dollars to the loan.)*
(ب) بەسەردا گونجاندن؛ بۆ بەکارهێنان:
*( A~ your knowledge to the problem.)*
(٣) کۆشش کردن: *( He ~ied himself to his work.)* .
*v.i.* (١) ( ~ to ; ~ for )، داواکردن:
*( He ~ied to several schools for a teaching job.)*
(٢) پەیوەندی پێوەبوون؛ گرتنەوە؛ بەسەردا گونجان:
*( This principle always ~ies. ; What I am saying does not ~ to you.)*
**appoint** (ə-point′), *v.t.* (١) دانان (کات، شوێن)؛ دیاری کردن:
*( He ~ed a time for the meeting.)*
(٢) دامەزراندن؛ دانان لەسەر کار: *( I ~ him chairman.)* .
(٣) ناومال ڕازاندنەوە: *( a well- ~ed house)* .
(٤) بڕینەوە یا بڕیار لەسەر دان لە دادگادا (زەوی وزار، سامان).
**appointee** (ə-poin´tē′), *n.* دانراو (لەسەر کار)؛ دامەزراو.
**appointment** (ə-point′mənt), *n.* (١) دانان (لەسەر کار)؛ دامەزران. (٢) کەسێکی دانراو یا دامەزراو. (٣) کار یا پلەی دیاریکراو. (٤) ژوان؛ بەڵێنی دیدەنی:
*( Our ~ is at two o'clock. ; He made an ~ to see the dean.)*
(٥) (*pl.*)، کەلوپەلی ناومال؛ کەرەسە.
(٦) بڕیاری خاوەنێتی و بەشکردنی زەوی وزار لە دادگادا.
**apportion** (ə-pôr′shən, ə-pōr′shən), *v.t.* دابەشکردن؛ بەشکردن (بەپێی نەخشەی تایبەتی).
**-apportionment** *(n.).*
**appose** (ə-pōz′), *v.t.* (١) لێدان (مۆر)؛ خستنەسەر:
*( to ~ a seal to a document)*
(٢) لە تەنیشت یەکەوە دانان.
**apposite** (ap′ə-zit), *adj.* بەجێ؛ پەسەند؛ درووست؛ شیاو:
*( an ~ remark)*
**apposition** (ap´ə-zish′ən), *n.* (١) بە تەنیشت یەکەوە دانان یا دانران. (٢) بە تەنیشت یەکەوە گەشەکردن (زیندەوەرناسی). (٣) دانانی ووشەیەك بە تەنیشت ووشەیەکی هاوواتاوە بۆ ڕوونکردنەوەی (ڕێزمان). (وەك ووشەی " cousin " لەم ڕستەیەدا):
*( Mary, my cousin, is here.)*
**appositive** (ə-poz′ə-tiv), *adj. & n.* لەباتی (ڕێزمان). (ژمارە سێی ووشەی پێشوو ببینە).
**appraisal** (ə-prāz′'l), *n.* نرخ لەسەر دانان؛ خەملاندن؛ هەڵسەنگاندن.
**appraise** (ə-prāz′), *v.t.* (١) نرخ لەسەر دانان؛ خەملاندن؛ قەبلاندن:
*( He ~d the house for fifty thousand dollars.)*
(٢) هەڵسەنگاندن.
**-appraiser** *(n.)*; **appraisement** *(n.).*
**appreciable** (ə-prē′shi-ə-b'l, ə-prē′shə-b'l), *adj.* ئەوتۆ؛ هەستپێکراو؛ زۆر: *( an ~ difference in temperature, pay, etc.)* .
**-appreciably** *(adv.).*
**appreciate** (ə-prē′shi-āt´), *v.t.* (١) نرخ زانین؛ هەستپێکردن؛ پێزانین (چاکە، کۆشش): *( His hard work was not ~d.)* .
(٢) جێی سوپاس بوون؛ سوپاس کردن: *( I ~ your kindness.)* .
(٣) چێژ لێوەرگرتن: *( to ~ poetry, music, nature, etc.)* .
(٤) بە قەوارە زانین یا هەستپێکردن: *( to ~ the difficulties ahead)* .
(٥) نرخ زیادکردن؛ نرخ بەرزکردنەوە.
*v.i.* نرخ بەرزبوونەوە؛ نرخ زیادبوون:
*( The house has ~d a lot since we bought it.)*
**appreciation** (ə-prē´shi-ā′shən), *n.* (١) پێزانین (چاکە)؛

نرخ زانین؛ هەستپێکردن. (٢) سوپاس؛ ڕێز.
٣) چێژ لێوەرگرتن؛ لێ تێگەیشتن و نرخ زانین: *(his ~ of art)* .
٤) نرخ بەرزبوونەوە.

**appreciative** (ə-prē′shi-ā′tiv), *adj.* نرخ زان؛ سوپاسکەر؛ پێزان (چاکە، کۆشش)؛ ڕێزگر. *( an ~ audience; He was very ~ .)* .

**-appreciatively** *(adv.).*

**apprehend** (ap′ri-hend′), *v.t.* (١) گرتن (گوناهبار، گومانبار).
(٢) تێگەیشتن؛ چوونە مێشکەوە. (٣) بە ترسەوە چاوەڕوان کردن؛ مەترسی کردن؛ لێ ترسان (ڕووداوی داهاتوو).

**apprehensible** (ap′ri-hen′sə-b'l), *adj.* مرۆڤ دەتوانێت تێی بگات.

**apprehension** (ap′ri-hen′shən), *n.* (١) گرتن (گوناهبار، گومانبار): *( the ~ of the suspect)* .
(٢) مەترسی؛ ترس؛ دڵەڕاوکێ:
*( He went into the examination room filled with ~ .)*
(٣) تێگەیشتن؛ چوونە مێشکەوە. (٤) ڕا.

**apprehensive** (ap′ri-hen′siv), *adj.* (١) زوو شت تێ دەگات.
(٢) هەست تیژ؛ بەسەرنج؛ وردبین.
(٣) مەترسیدار؛ پڕ لە مەترسی؛ دوودڵ:
*( I am very ~ about his visit.)*

**apprentice** (ə-pren′tis), *n.* (١) شاگرد؛ بەروەستا.
(٢) نەوکار؛ تازەکوورە؛ نەشارەزا.
*v.t.* کردن بە شاگرد؛ شاگردی کردن.

**apprenticeship** (ə-pren′tis-ship′), *n.* (١) شاگردێتی؛ شاگردی؛ بەروەستایی. (٢) ماوەی شاگردێتی؛ ئەرکی شاگرد.
(٣) ماوەی ڕاهاتن یا فێربوون؛ ڕاهاتن؛ فێربوون.

**appressed** (ə-prest′, a-prest′), *adj.* بە تەختی لەسەر ڕوویەکە یا پێوەی نووساوە (ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی).

**apprise, apprize** (ə-prīz′), *v.t.* ئاگادارکردن؛ پێ ڕاگەیاندن؛ پێ ووتن.

**approach** (ə-prōch′), *v.i.* نزیکبوونەوە (کات، شوێن، ڕادە):
*( Winter ~ed.)*
*v.t.* (١) لێ نزیکبوونەوە؛ چوون بەرەو؛ هاتن بەرەو:
*( He ~ed manhood. ; We ~ed the town.)*
(٢) لێ نزیک کردنەوە.
(٣) لێکچوون؛ لەیەکترچوون؛ لێککردن (شێوە).
(٤) شان لە شان دان؛ خۆ لە قەرە دان:
*( He is such a good musician no one can ~ him.)*
(٥) لێ نزیکبوونەوە و داوالێکردن؛ پێشنیازکردن؛ پێ ووتن:
*( I ~ed him about giving you a job.)*
(٦) دەست بە کارکردن لەسەر.
*n.* (١) لێکچوون (شێوە)؛ لێککردن. (٢) لێ نزیکبوونەوە.
(٣) (*pl.*)، خۆ لێ نزیک کردنەوە (بۆ سەرنج ڕاکێشان، قسە لەگەڵ کردن... هتد):
*( All his ~es failed.)*
(٤) ڕێگە؛ ڕێگەی چوونەژوورەوە؛ شوێنی تێپەڕبوون:
*( All the ~es to the city were guarded by soldiers.)*
(٥) ڕێگە؛ ڕێباز؛ شێوەی کردن؛ شێواز:
*( When learning a foreign language, the best ~ is the study of the spoken language. ; He has a practical ~ to problems.)*

**approachable** (ə-prōch′ə-b'l), *adj.* (١) مرۆڤ دەتوانێ بیگاتێ.
(٢) دەتوانرێ قسەی لەگەڵ بکرێت؛ ڕووخۆش.

**-approachability** *(n.).*

**approbate** (ap′rə-bāt′), *v.t.* پەسەندکردن.

**approbation** (ap′rə-bā′shən), *n.* (١) پەسەندکردن.
(٢) ستایش؛ ئافەرین.

**appropriate** (ə-prō′pri-āt′), *v.t.* (١) دەست بەسەردا گرتن؛ لێسەندن: *( The government ~d their property.)* .
(٢) دزین. (٣) تەرخان کردن (پارە)؛ بۆ دانان (پارە):
*( The legislature ~d money for the schools.)*
*adj.* بەجێ؛ درووست؛ شیاو؛ جوان؛ باش؛ گونجاو:
*( an ~ behavior, response, answer, place, time, dress, etc.)*

**-appropriateness** *(n.)*; **appropriator** *(n.).*

**appropriately** (ə-prō′pri-āt′li), *adv.* بە ڕێکوپێکی؛ بە جوانی و باشی: *( You should behave ~ .)* .

**appropriation** (ə-prō′pri-ā′shən), *n.* (١) دەست بەسەردا-گرتن؛ لێسەندن (زەوی‌وزار). (٢) تەرخان کردن (پارە)؛ بۆ دانان (پارە بۆ پرۆژەیەکی گشتی). (٣) پارەی تەرخان کراو (لەلایەن میرییەوە بۆ پرۆژەیەکی گشتی).

**approval** (ə-prōōv′'l), *n.* (١) پەسەندکردن؛ مۆرکردن؛ ڕەزامەندی.
(٢) بەدڵ بوون؛ پەسەندکردن. (٣) ئافەرین.
**goods on approval,** شتوومەکێك کە کڕیار دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە ئەگەر بەدڵی نەبوو.

**approve** (ə-prōōv′), *v.t.* (١) پەسەندکردن؛ مۆرکردن.
(٢) بە لاوە باش بوون؛ ڕا لەسەر بوون.
*v.i.* **( ~ of ),** پەسەندکردن (مرۆڤ، شت، کردەوە):
*( to ~ of a person, a behavior, an act, etc.)*

**-approvable** *(adj.)*; **approvingly** *(adv.).*

**approved** (ə-prōōvd′), *adj.* پەسەندکراو؛ مۆرکراو.

**approximate** (ə-prok′sə-mit), *adj.* (١) نزیك؛ لەیەکەوە نزیك.
(٢) وەك؛ وەك یەك؛ چوونیەك.
(٣) نزیکەیی: *( the ~ population of London is ten million.)* .
*v.t.* (١) لێکچوون؛ لێککردن؛ وەك یەك وابوون؛ لێوە نزیك بوون (چۆنێتی):
*( This painting ~s reality.)*
(٢) لێ نزیك کردنەوە؛ هێنانە نزیکەوە.
*v.i.* لێکچوون؛ وەك یەك وابوون.

**approximately** (ə-prok′sə-mit-li), *adv.* نزیکەی:
*( There were ~ twenty people in the room.)*

**approximation** (ə-prok′sə-mā′shən), *n.* (١) لێکچوون؛ لێ نزیك بوونەوە (چۆنێتی). (٢) نزیکەیی: *( That figure is an ~ .)* .

**appurtenance** (ə-pūr′t'n-əns), *n.* (١) پاشکۆ.
(٢) ماڵێکی زیادە و ناسەرەکی.

**Apr.,** = **April**

**apricot** (ā′pri-kot′, ap′ri-kot′), *n.* (١) قەیسی. (٢) دارقەیسی.
(٣) زەردێکی پرتەقاڵی؛ ڕەنگی قەیسی.

**April** (ā′prəl), *n.* گوڵان؛ شەستەباران؛ نیسان.

**April fool,** هەڵخەڵەتاوێك بە درۆی نیسان.

**April Fools' Day,** درۆی نیسان.

**a priori** (ā′ prī′ō′rī, ä′ pri-ôr′i), *adj. & adv.* (١) لە هۆوە بۆ ئەنجام (فەلسەفە، ژیربێژی)؛ لە گشتییەوە بۆ تایبەتی؛ لە تیۆرییەوە بۆ کردەنی. (٢) گریمانەکی؛ بێ بەڵگە؛ لەسەر تیۆری بەندە نەك تاقیکردنەوە.

**apron** (ā′prən, ā′pērn), *n.* (١) بەروانکە؛ کراس؛ سینەبەرە.
(٢) مشەمایەکی ئاوبڕە بۆ بەسەر ئوتومبیل یا عەرەبانەدا دان.
(٣) بەردەمی قیرتاوکراوی گەراجی فڕۆکە. (٤) بەردەمی پەردەی شانۆ.
(٥) قایشی بزۆکی شت گواستنەوە.
(٦) دیوارێکی دارینەی قەراغ ڕووبارە (بۆ نەشتنەوەی خاکەکەی بە لافاو).
*v.t.* بەروانکە کردنەبەر.

**apropos** (ap′rə-pō′), *adv.* (١) بەجێ؛ لە جێی خۆیدا (تێبینی)؛ لە کاتی خۆیدا؛ لەبار. (٢) بەم بۆنەیەوە (لە پێناسین یا پێشکەش کردندا).
*adj.* بەجێ؛ درووست؛ شیاو: *( ~ remarks)* .
**apropos of,** دەربارەی؛ سەبارەت بە.

**apse** (aps), *n.* (١) بەشێکی دەرپۆقیوی نیوبازنەیی گوومەز بەسەرەوەی لای ڕۆژهەلاتی کلێسەیەکەوە. (٢) **apsis**.

**apsis** (ap′sis), *n.* نزیکترین و دوورترین خاڵی خولگەی ئەستێرەیەکی گەڕۆکە لەو ئەستێرەیەی کە بەدەوریدا دەخوولێتەوە. (پێیان دەوترێت: **lower apsis** هەروەها **higher apsis**).

**apt** (apt), *adj.* (١) بەجێ: لە جێی خۆیدا؛ درووست: *( an ~ statement)*
(٢) بۆی هەیە: لەوانەیە: *( Idle children are ~ to get into mischief.)*
(٣) زیرەك؛ دانا. *( an ~ student)*
(٤) [Archaic]. ئامادە.

**apt.**, = **apartment.**

**apteral** (ap′tēr-əl), *adj.* (١) کۆڵەکەی لەمسەرو ئەوسەرەوە هەیە بەلام نەك لە ناوەڕاستدا. (٢) بێ باڵ (باڵندە).

**apterous** (ap′tēr-əs), *adj.* بێ باڵ (باڵندە).

**apteryx** (ap′tēr-iks), *n.* مەلێکی بێ کلکی بێ باڵی دەنووك درێژە پەڕەکەی لە تووك دەچێت.

**aptitude** (ap′tə-to͞od′, ap′tə-tūd′), *n.* (١) گونجان: شیان؛ شیاوی؛ بەجێیی. (٢) مەیلی سرووشتی.
(٣) بەهرە؛ توانای مێشك؛ لێهاتوویی. (٤) زیرەکی؛ دانایی.

**aptitude test,** تاقیکردنەوەی لێهاتوویی.

**aqua** (ak′wə, ä′kwə, ā′kwə), *n.* (١) ئاو
(٢) شلە (دەرمانسازی)؛ لە ئاودا گیراوە.
*adj.* سەوزی شینکار

**aquacade** (ak′wə-kād′), *n.* نووانندنێکی ئاو ئاوە بە مۆسیقاوە (مەلە، خۆفڕێدانە ناو ئاوەوە لە بەرزییەوە).

**aquamarine** (ak′wə-mə-rēn′), *n.* (١) بەردێکی بەنرخی ڕووناکی سەوزی شینکارە. (٢) سەوزی شینکار.

**aquarium** (ə-kwâr′i-əm), *n.* (١) حەوزێکی شووشەیە ماسی و زیندەوەری ئاوی تری تێدا بەخێودەکرێت.
(٢) پیشانگای ماسی و زیندەوەری ئاوی تر

**Aquarius** (ə-kwâr′i-əs), *n.* (١) کۆنەستێرەی ئاودەر یا ئاوتێکەر.
(٢) بورجی سەتڵ (ئەستێرەناسی).

**aquatic** (ə-kwat′ik, ə-kwät′ik), *adj.* (١) ئاوی (گیاندار، ڕووەك) *( ~ animals and plants)*.
(٢) ئاوی (وەرزش)؛ لە ئاودا دەکرێت: *( ~ sports)*.
*n.* ڕووەك یا گیاندارێکی ئاوی.

**aquatics** (ə-kwat′iks, ə-kwät′iks), *n.pl.* وەرزش یا یاری ناو ئاو.

**aqueduct** (ak′wi-dukt′), *n.* (١) ئاوبارە؛ قوم؛ جۆگەی ئاو.
(٢) ئەو خانوو یا بەرزاییەی کە ئاوبارەی ڕاگرتووە.
(٣) بۆری یا ڕێڕەو (توێکاری).

**aqueous** (ā′kwi-əs, ak′wi-əs), *adj.* (١) ئاوی؛ لە ئاو چوو.
(٢) کردەی ئاو (وەك بەردی لە خڵتە درووست بوو).
(٣) ئاوی چاو؛ تەڕیی ناو چاو.

**aqueous humor,** تەڕیی ناو چاو؛ ئاوی چاو.

**aquiculture** (ak′wi-kul′chēr), *n.* پەروەردەکردنی ڕووەك لەناو ئاودا لەبری زەوی

**Aquila** (ak′wi-lə), *n.* ناوی کۆنەستێرەیەکی هێڵی کاکێشانە گوایە لە باز دەچێت

**aquiline** (ak′wə-līn′, ak′wə-lin), *adj.* (١) وەك باز؛ هی باز.
(٢) وەك هی باز (لووتی چەماوە): *( an ~ nose)*

**-ar** (ēr), پاشگرێکە بەمانای: وەك؛ هی؛ لێکچوو: *(polar, titular)*.

**Arab** (ar′əb), *n.* (١) عەرەب؛ عەرەبێك. (٢) ئەسپی عەرەبی.
*adj.* عەرەبی.

**arabesque** (ar′ə-besk′), *n.* (١) نەخش‌ونیگاری عەرەبی؛ نەخش‌ونیگاری ئاڵۆز. (٢) هەڵوێستێکە لە یاری " باڵێ " دا بریتییە لە ڕاکێشانی لاق و باڵێك بۆ دواوە و باڵەکەی تر بۆ پێشەوە.
(٣) پارچەیەك مۆسیقای کورت.
*adj.* تایبەتی بە نەخش‌ونیگاری عەرەبی؛ ئاڵۆز.

**Arabian** (ə-rā′bi-ən, ə-rā′byən), *adj.* عەرەبی.
*n.* (١) عەرەب؛ عەرەبێك؛ هاوڵاتییەکی عەرەب. (٢) ئەسپی عەرەبی.

**Arabian Nights,** چیرۆکی " هەزارو یەك شەوە " ی عەرەبی.

**Arabic** (ar′ə-bik), *adj.* (١) عەرەبی؛ تایبەتی بە عەرەبستان.
(٢) تایبەتی بە عەرەب و زمان و کلتوورەکەیان؛ عەرەبی.
*n.* زمانی عەرەبی؛ عەرەبی.

**Arabic numerals,** ژمارەی عەرەبی.

**Arabist** (ar′əb-ist), *n.* زانای زمان و وێژەی عەرەبی.

**arable** (ar′ə-b'l), *adj.* بە کەڵکی کشتوکاڵ کردن دێت؛ بۆ کشتوکاڵ کردن باشە: *( ~ land)*.
*n.* زەوی کشتوکاڵ.

**Arab League,** ئەنجوومەنی وڵاتە عەرەبییەکان.

**arachnid** (ə-rak′nid), *n.* جانەوەری هەشت پێ (جاڵجاڵۆکە، دووپشك).

**arachnoid** (ə-rak′noid), *adj.* (١) تایبەتی بە پەردەی ناوەڕاستی مێشك و بڕبڕەی پشت (کە تەنکە وەك هێلانەی جاڵجاڵۆکە).
(٢) تایبەتی بە جانەوەری هەشت پێ.
(٣) بە تووکی نەرم و ئاڵۆز داپۆشراو.
*n.* (١) پەردەی مێشك و بڕبڕەی پشت. (٢) جانەوەری هەشت پێ.

**arbalest, arbalist** (är′bə-list), *n.* جۆرە چەکێکە لە کۆندا تیرو بەردیان پێ دەهاویشت.

**arbiter** (är′bi-tēr), *n.* سەرپشك.

**arbitrable** (är′bə-trə-b'l), *adj.* سەرپشکی تێدا دەکرێت؛ ناوبژی دەکرێت.

**arbitrage** (är′bə-trij), *n.* (١) سەرپشکی؛ ناوبژی.
(٢) کڕین لە بازاڕێك و فرۆشتنەوە لە بازاڕێکی تردا (پارەبازی، بۆرسە).

**arbitrament** (är-bit′rə-mənt), *n.* (١) سەرپشکی؛ ناوبژی.
(٢) بڕیاری سەرپشك. (٣) دەسەڵاتی سەرپشك.

**arbitrarily** (är′bə-trer′ə-li), *adv.* بە هەوەس؛ بە ئارەزوو؛ بەبێ هۆ؛ بەبێ لێکۆڵینەوە؛ بە ناڕەوایانە؛ زۆردارانە؛ لەخۆوە.

**arbitrariness** (är′bə-trer′i-nis), *n.* ناڕەوایەتی؛ هەوەسکاری؛ ئارەزووکاری.

**arbitrary** (är′bə-trer′i), *adj.* (١) هەوەسکاری؛ ئارەزووکاری؛ بێ سەروبەر؛ نابەجێ؛ لەخۆوە: *( an ~ decision)*.
(٢) زۆردار؛ زاڵم؛ ستەمکار: *( an ~ ruler)*.

**arbitrate** (är′bə-trāt′), *v.t.* (١) سەرپشکی کردن؛ ناوبژی کردن.
(٢) دان بە سەرپشك بۆ بڕینەوەی (ناکۆکی)؛ پەنابردنەبەر سەرپشك.
*v.i.* (١) بوون بە سەرپشك. (٢) ناکۆکییەك دان بە سەرپشك بۆ بڕینەوەی.
-**arbitration** *(n.)*.

**arbitrator** (är′bə-trā′tēr), *n.* سەرپشك؛ ناوبژیکەر.

**arbitress** (är′bə-tris), *n.* سەرپشك (ژن).

**arbor, arbour** (är′bēr), *n.* (١) کەپر؛ سابات.
(٢) [Obs]، باخ؛ بێستان.

**arbor** (är′bēr), *n.* (١) ستوون؛ شیش؛ دەستەك.
(٢) تەوەر؛ تەوەرە. (٣) درەخت؛ دار.

**Arbor Day,** جەژنی دارودرەخت.

**arboreal** (är-bôr′i-əl, är-bō′ri-əl), *adj.* (١) دارودرەختی.
(٢) لە دارو درەختدا دەژی.

**arboreous** (är-bôr′i-əs, är-bō′ri-əs), *adj.* (١) دارودرەختاوی؛ پڕ لە دارودرەخت. (٢) دارودرەختی؛ لە درەخت دەچێت؛ لق‌وپۆپدار.

**arborescent** (är´bə-res′'nt), *adj.* داردرەختی؛ لق وپۆپدار؛ لە درەخت دەچێت.

**arboretum** (är´bə-rē′təm), *n.* (١) پیشانگای درەخت.
(٢) باخێکی گشتی پڕ لە دارودرەخت.

**arboriculture** (är′bə-ri-kul´chēr), *n.* زانستی دارودرەخت.

**arborization** (är´bēr-i-zā′shən), *n.* (١) شێوەیەکی وەك درەخت (بەتایبەتی زیندەوەری بوو بە بەردی ژێر خاك).
(٢) وەك درەخت لێهاتن لە شێوەدا.

**arborous** (är′bēr-əs), *adj.* دارودرەختی؛ تایبەتی بە درەخت.

**arbour** (är′bēr), *n.* کەپر؛ سابات.

**arc** (ärk), *n.* (١) کەوانە؛ هێڵی چەماوە؛ بەشێکی بازنە یا هێڵی چەماوە.
(٢) تاق. (٣) هێڵێکی کارەبایی شەوقدار لەنێوان دوو جەمسەری کارەباییدا.
(٤) ڕێڕەوی وەك چەماوە دیاری ئەستێرەیەك.

*v.i.* نووشتانەوە؛ چەمینەوە.

**arcade** (är-kād′), *n.* (١) ڕاڕەوێکی تاق تاقاوی سەرگیراو.
(٢) قەیسەری. (٣) (ا) ڕیزە تاقێك و کۆڵەکەکانیان. (ب) خانوویەکی تاقدار.

*v.t.* تاق بۆ دروستکردن؛ سەرگرتن بە تاق.

**arcane** (är-kān′), *adj.* نهێنی؛ شاراوە؛ نادیار.

**arcanum** (är-kā′nəm), *n.* (١) شتێکی شاراوە یا نهێنی (کە تەنها کەسانی تایبەتی لێی تێ بگەن یا بیزانن). (٢) **elixir** .

**arch** (ärch), *n.* (١) تاق (خانوو، پرد).
(٢) پەیکەرێکی یادگاری لە تاق چوو. (٣) شێوەی تاق.
(٤) شتێکی کەوانەیی.
(٥) ئەندامێکی کەوانەیی لەش: ***( ~ of the foot)*** .

*v.t.* (١) تاق بۆ کردن؛ تاق بۆ دانان.
(٢) چەماندنەوە؛ نوشتاندنەوە: ***( The cat ~ed its back.)*** .

*v.i.* وەك تاق یا کەوانە لێهاتن؛ نوشتانەوە.

**arch** (ärch), *adj.* (١) سەرەکی؛ سەرەك؛ سەرگەورە؛ هەرە گەورە: ***(archbishop, archduke)***
(٢) هەرە گەورەو فێڵبازو ناپەسەند: ***( ~ villain)*** .
(٣) تایبەتی بە گەمەو تەشقەڵەو گۆبەن حەزلێکردن: ***( an ~ look)*** .

**arch-** (ärch), پێشگرێکە بەمانای: سەرەکی؛ سەرەك؛ گەورە: ***(archbishop, archduke)***

**-arch** (ärk), پاشگرێکە بەمانای: فەرمانڕەوا؛ سەرگەورە (خێزان، خێڵ، لقی ئاینی... هتد): ***(matriarch, patriarch)*** .

**archaeo-** (är′ki-ō), پێشگرێکە بەمانای: کۆن: ***(archaeology)*** .

**archaeological** (är´ki-ə-loj′i-k'l), *adj.* شوێنەواری؛ تایبەتی بە شوێنەوارناسی؛ کۆنناسی.

**archaeologist** (är´ki-ol′ə-jist), *n.* شوێنەوارزان؛ دێرینەزان؛ زانای شوێنەوار؛ زانای شوێنەواری دێرین؛ کۆنزان؛ کۆنناس.

**archaeology** (är´ki-ol′ə-ji), *n.* شوێنەوارزانی؛ دێرینزانی؛ لێکۆڵینەوەی ژیارو کلتووری میللەتانی کۆن بە کنەکردن لە ژێرزەویدا.

**archaeopteryx** (är´ki-op′tēr-iks), *n.* باڵندەیەکی کۆنی فەوتاوی خشۆك ئاسایییە.

**archaic** (är-kā′ik), *adj. Abbreviated* **arch.**, (١) کۆن.
(٢) باونەماو؛ کۆن بوو.
(٣) کۆن: ***( "Thou" is an ~ form of "you" .)*** .

**-archaically** ***(adv.).***

**archaism** (är′ki-iz'm, är′kā-iz'm), *n.* (١) بەکارهێنانی ووشە یا شێوازێکی کۆن. (٢) ووشە یا شێوازێکی کۆن.

**-archaist** ***(n.)***; **archaistic** ***(adj.).***

**archangel** (ärk′ān´jəl), *n.* فریشتە گەورە؛ سەرەك فریشتە؛ کەڵە فریشتە.

**archbishop** (ärch′bish′əp), *n.* سەرەك قەشە؛ کەڵە قەشە؛ قەشەی هەرە گەورە.

**archbishopric** (ärch´bish′əp-rik), *n.* (١) پایەو دەسەڵات و ئەرکی سەرەك قەشە. (٢) ناوچەی لێپرسراوی سەرەك قەشە.

**archdeacon** (ärch′dē′k'n), *n.* ڕابەرێکی کڵێسەیە پلەیەك لەخوار سەرەك قەشەوەیە.

**archdiocese** (ärch´dī′ə-sēs´, ärch´dī′ə-sis), *n.* ناوچەی لێپرسراوی سەرەك قەشە.

**archduchess** (ärch′duch′is), *n.* (١) ژن یا بێوەژنی سەرەك دۆق.
(٢) کچە شازادەیەکی " نەمسا " ی کۆن.

**archduchy** (ärch′duch′i), *n.* سەرەك دۆق نشین؛ ژنە سەرەك دۆق نشین.

**archduke** (ärch′dōōk′, ärch′dūk′), *n.* سەرەك دۆق– (بەتایبەتی شازادەیەکی " نەمسا " ی کۆن).

**arched** (ärcht), *adj.* (١) تاق تاق؛ بە تاق دروستکراو.
(٢) چەماوە؛ نووشتاوە؛ کەوانەیی.

**archenemy** (ärch′en´ə-mi), *n.* دوژمنی هەرە گەورە.
**the archenemy,** شەیتان.

**archenteron** (är-ken′tēr-on), *n.* ڕیخۆڵەی ئاوڵەمە.

**archeo-** (är′ki-ō), = **archaeo-**.

**archeology** (är´ki-ol′ə-ji), *n.* = **archaeology.**

**Archeozoic** (är´ki-ə-zō′ik), *adj.* تایبەتی بە زەمانی زۆر کۆن.

**archer** (ärch′ēr), *n.* (١) تیرەوان؛ تیرهاوێژ؛ تیروکەوانچی.
(٢) کۆنەستێرەی تیرهاوێژ.

**archery** (ärch′ēr-i), *n.* (١) تیروکەوانچێتی؛ تیربازی.
(٢) تیروکەوان. (٣) تیربازان؛ تیرهاوێژان.

**archespore** (är′ki-spôr´, är′ki-spōr´), *n.* کۆمەڵە شانە؛ دایکە شانە (ڕووەکناسی).

**archetype** (är′kə-tīp´), *n.* یەکەم نموونە؛ یەکەم قاڵب؛ نموونەی سەرەتا یا بنچینە.

**-archetypal** ***(adj.)***; **archetypical** ***(adj.).***

**archfiend** (ärch′fēnd´), *n.* شەیتانە گەورە.
**the archfiend,** شەیتان.

**archi-** (är′ki), پێشگرێکە بەمانای: (١) سەرەکی؛ یەکەم.
(٢) سەرەتایی.

**archil** (är′kil), *n.* (١) قەوزەیەکە خومی وەنەوشەیی لێ دەردەهێنرێت.
(٢) ئەم خومە.

**archimage** (är′ki-māj´), *n.* کەڵە جادووگەر.

**archimandrite** (är´ki-man′drīt), *n.* سەرەك پەرستگا (کڵێسەی– ڕۆژهەڵاتی).

**Archimedean** (är´ki-mē′di-ən), *adj.* ئەرخەمیدی؛ تایبەتی بە ئەرخەمیدس.

**Archimedean screw,** جەڕی ئەرخەمیدی: بریتییە لە بۆرییەکی پێچاوپێچی لە شیشێکەوە پێچراو بۆ ئاو بەرزکردنەوە.

**arching** (är′chiŋ), *adj.* نووشتاوە؛ چەماوە؛ کەوانەیی.

*n.* (١) شتێکی کەوانەیی. (٢) ڕیزە تاق.

**archipelago** (är´kə-pel′ə-gō´), *n.* (١) دەریایەکی پڕ لە دوورگە.
(٢) کۆمەڵە دوورگەیەکی وەها. (٣) [A-]، دەریای ئەرخەبیل.

**architect** (är′kə-tekt´), *n.* (١) نەخشەکێش (خانوو، پرد... هتد)؛ خانووساز؛ ئەندازیاری تەلارساز.
(٢) نەخشەکێش (پیلان، پرۆژە، ڕووداو)؛ نەخشەکار: ***( the ~ of the peace plan)***

**architectonic** (är´ki-tek-ton′ik), *adj.* نەخشەکاری؛ نەخشەکێشی (خانووسازی).

**architectonics** (är´ki-tek-ton′iks), *n.pl.* (١) تەلارسازی؛ زانستی خانووسازی.
(٢) زانستی هەڵبەستن یا نەخشەکاری:

***(the ~ of Beethoven's symphonics)***
(٣) بابەت کردن و لێکدانی زانیاری (فەلسەفە).

**architectural** (är´kə-tek′chẽr-əl), ***adj.*** (١) هی خانووسازی؛ تایبەتی بە نەخشەکاری خانوو؛ تایبەتی بە تەلارسازی.
(٢) ڕێك و پێك؛ لەسەر نەخشە کراو.
**-architecturally** ***(adv.).***

**architecture** (är′kə-tek´chẽr), ***n.*** (١) زانستی تەلارسازی؛ نەخشەکێشی خانوو؛ خانووسازی. (٢) خانوو؛ کۆمەڵە خانوو.
(٣) شێوازێکی خانووسازی تایبەتی: ***(Victorian ~)***.
(٤) نەخشە

**archives** (är′kīvz), ***n.pl.*** (١) ئەرشیف: شوێنی کۆکردنەوە و هەڵگرتن و پارێزگاری کردنی بڕوانامە و تۆمارنامە و نووسراوی تری کۆن.
(٢) بڕوانامە و تۆمارنامە و نووسراوی تری کۆنی کۆکراوە لەم شوێنەدا.

**archivist** (är′kə-vist), ***n.*** لێپرسراوی ئەرشیف، واتە شوێنی هەڵگرتن و پاراستنی بڕوانامە و تۆمارکراوە کۆنەکان.

**archivolt** (är′kə-vōlt´), ***n.*** (١) دیوی ناوەوەی تاقێك
(٢) نەخش و نیگاری سەر دیواری تاقێك.

**archly** (ärch′li), ***adv.*** بە شەیتانانە؛ بە گۆبەنانە.

**archon** (är′kon, är′kən), ***n.*** (١) یەکێك لە نۆ کەڵە دادگەرەکانی "ئەسینا"، واتە یۆنانی کۆن. (٢) فەرمانڕەوا.

**archpriest** (ärch′prēst′), ***n.*** (١) کەڵە قەشە؛ سەرەك قەشە.
(٢) لایەنگرە هەرەگەورە (تیۆری، ڕێباز، بیروڕا)؛ پێشنیازکەری سەرەکی.

**archway** (ärch′wā´), ***n.*** (١) ڕاڕەوی ژێر تاق؛ دەرگای ژێر تاق.
(٢) تاق

**-archy** (är-ki, ẽr-ki), پاشگرێکە بەمانای: فەرمانڕەوایی؛ ڕژێم:
***(monarchy)***

**arctic** (ärk′tik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە تەوەری باکووری زەوی.
(٢) زۆر سارد
***n.*** (١) تەوەری باکووری زەوی؛ ناوچەی دەوروپشتی تەوەری باکووری زەوی. (٢) بازنەی تەوەری باکووری زەوی. (٣) کاڵۆش.

**Arctic Circle, arctic circle,** بازنەی تەوەری باکووری زەوی.

**arcuate** (är′kū-it, är′kū-āt´), ***adj.*** کەوانەیی؛ چەماوە

**-ard** (ẽrd), پاشگرێکە بەمانای: کەسێکی شت لە تام کەرە دەرەوە:
***(drunkard)***

**ardency** (är′d'n-si), ***n.*** جۆش.

**ardent** (är′d'nt), ***adj.*** (١) گەش؛ بریقەدار؛ ئاگرین: ***(~ eyes)***.
(٢) بەجۆش؛ گەرم؛ بەدڵ؛ بەتین؛ بەهێز:
***(an ~ student ; an ~ longing ; an ~ supporter of the plan)***
(٣) [Obs.]. گڕاوی؛ گڕگرتوو؛ داگیرساو.

**ardent spirits,** خواردنەوەی کحوولی بەهێز (براندی، ویسکی).

**ardor, ardour** (är′dẽr), ***n.*** (١) جۆش؛ دڵ گەرمی؛ قین؛ پەرۆش؛ هەستی گەرم (٢) ئاگر؛ گەرما؛ گەرمایەکی بەتین.

**arduous** (är′jōō-əs), ***adj.*** (١) گران (ئەرك، کار)؛ قورس:
***(the ~ task of preparing a dictionary)***
(٢) سەخت؛ ناخۆش؛ هێز لێ بڕ: ***(a long and ~ war)***.
(٣) سەخت؛ پیا سەرکەوتن یا پیا ڕۆیشتنی گرانە ***(an ~ path)***.
(٤) زۆر کۆششکەر؛ بەتین

**are** (är), *the plural and second person singular, present indicative, of* **be.,** کردارێکە بەمانای: بوون؛ وابوون:
***(You ~ a student. ; We ~ here. ; We ~ talking.)***

**are** (âr), ***n.*** پێوانەیەکی ڕووە بریتییە لە سەد مەترە دووجا.

**area** (âr′i-ə), ***n.*** (١) پارچەیەك زەوی تەخت
(٢) ناوچە؛ هەرێم؛ شوێن
(٣) ڕووبەر؛ ڕوو؛ پانتایی: ***(an ~ of ten square kilometers)***.
(٤) حەوشە
(٥) (أ) مەودا؛ ڕادە: ***(the whole ~ of foreign policy)***.
(ب) ڕوو؛ دەربارە: ***(in this ~)***.

**areaway** (âr′i-ə-wā´), ***n.*** (١) حەوشەیەکی نزم کە دەچێت بۆ ژێرخانێك. (٢) ڕاڕەوی نێوان چەند خانوویەك.

**areca** (ar′i-kə, ə-rē′kə), ***n.*** دارێکی قەدسافە لە توخمی دارخورما.

**arena** (ə-rē′nə), ***n.*** (١) گۆڕەپانی زۆرانبازی لە سەردەمی ڕۆمانەکاندا.
(٢) گۆڕەپان؛ یاریگا؛ مەیدان: ***(an ~ for boxing matches)***.
(٣) مەیدانی ناکۆکی؛ شوێنی نواندن و چالاکی: ***(the ~ of politics)***.
(٤) شانۆیەکی خڕە کورسی بەدەوریدا دانراوە: ***(~ theatre)***.

**arenaceous** (ar´i-nā′shəs), ***adj.*** (١) لمین؛ لە لم پێکهاتوو؛ لمی:
***(~ limestone)***
(٢) لە لمدا دەڕوێت یا دەژی.

**arenicolous** (ar´i-nik′ə-ləs), ***adj.*** لەناو لمدا دەژی (گیاندار).

**aren't** (ärnt), = **are not.**

**areola** (ə-rē′ə-lə), ***n.*** (١) شوێنێکی بچووك وەك هی نێوان دەماری گەڵا.
(٢) پەڵەی دەوروپشتی شتێك (وەك پەڵە ڕەشەکەی دەوری گۆی مەمك).
(٣) بۆشایی لەش (زیندەوەرناسی).

**areole** (âr′i-ōl´), ***n.*** = **areola.**

**Areopagus** (ar´i-op′ə-gəs), ***n.*** (١) گردی "ئاریۆپاگەس" لە ئەسینا، واتە یۆنانی کۆن: بارەگای دادگای بەرزی ئەسینا. (٢) ئەم دادگایە.
(٣) دادگایەکی گرنگ.

**Ares** (âr′ēz), ***n.*** خودای جەنگ (ئەفسانەی یۆنانی).

**arête** (ə-rāt′), ***n.*** لووتکە شاخێکی تیژ.

**argal** (är′g'l), ***n.*** = **argali.**

**argali** (är′gə-li), ***n.*** مەڕەکێوی.

**argent** (är′jənt), ***n.*** (١) [Archaic or Poetic]، زیو.
(٢) [Obs.]، پارەی زیو؛ پارە.
***adj.*** زیوی؛ زیو؛ سپی.
**-argental** ***(adj.)***; **argenteous** ***(adj.).***

**argentiferous** (är´jən-tif′ẽr-əs), ***adj.*** زیوی تێدایە؛ زیوی لێ دەردەهێنرێت.

**argentine** (är′jən-tin, är′jən-tīn´), ***adj.*** لە زیو دەچێت؛ زیوی.
***n.*** (١) زیو. (٢) کانزایەکی لە زیوچوو.

**argil** (är′jil), ***n.*** گڵەجان؛ گڵی گۆزەو دیزە.

**argillaceous** (är´ji-lā′shəs), ***adj.*** گڵەجانی.

**argillite** (är′ji-līt´), ***n.*** بەردی گڵەجان.

**Argive** (är′jīv), ***adj.*** (١) ئارگۆسی: بە ناوی "ئارگۆس" ەوە کە ناوچەیەکی کۆنی یۆنانە. (٢) یۆنانی.
***n.*** (١) دانیشتوویەکی "ئارگۆس". (٢) کەسێکی یۆنانی؛ یۆنانییەك.

**Argo** (är′gō), ***n.*** (١) کەشتییەکی ئەفسانەیی یۆنانییە.
(٢) بورجی کەشتی (ئەستێرەناسی)؛ کۆئەستێرەی کەشتی.

**argol** (är′g'l), ***n.*** خڵتەی بن بەرمیلی مەی.

**argon** (är′gon), ***n.*** ئارگۆن: گازێکی بێ ڕەنگی بێ بۆنە لە هەوادا لە گڵۆپی کارەبایی و چووپی ڕادیۆدا بەکاردەهێنرێت.

**argosy** (är′gə-si), ***n.*** (١) کەشتییەکی گەورە (بەتایبەتی هی بازرگانی).
(٢) گەلەکەشتییەکی وەها.

**argot** (är′gō, är′gət), ***n.*** زمان یا زاراوەی ناو دەستە یا چینێکی هاوپیشە (بەتایبەتی هی بەدکارو تاوانباران).

**arguable** (är′gū-ə-b'l), ***adj.*** (١) چەندوچۆنی لەسەر دەکرێت؛ مشتومڕی لەسەر دەکرێت. (٢) بەڵگەدار؛ بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە.

**argue** (är′gū), ***v.i.*** (١) بەڵگەهێنانەوە (بۆ یا دژ بە پێشنیازێك یا شتێك):
***(He ~d for the proposal. ; She ~d against the proposal.)***
(٢) مشتومڕکردن؛ چەندوچۆن کردن:
***(She ~d with him about everything.)***
(٣) پەلپ گرتن.

*v.t.* (١) بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ بەڵگەهێنانەوە دژی.
(٢) مشتومڕ لەسەرکردن؛ باسکردن: *( The council ~d the case.)*.
(٣) وا دەرخستن؛ پیشاندان:
*( His accent ~s him to be a foreigner.)*
(٤) (ا) پێ سەلماندن: *( He ~d me into going.)*.
ب) پەشیمان کردنەوە: *( He ~d me out of going.)*.

**argument** (är'gyoo-mənt), *n.* (١) مشتومڕ؛ دەمەقاڵێ.
(٢) بەڵگە: *( What is his ~ ? ; I like his ~ .)*.
(٣) پوختەی باس؛ کورتە. (٤) سەرباس؛ باس.

**argumentation** (är'gyoo-men-tā'shən), *n.* (١) مشتومڕ؛ چەندوچوون. (٢) بەڵگەهێنانەوە (بۆ یا دژ بە مەسەلەیەك)؛ چۆنێتی پێشکەش کردنی ئەم بەڵگەیەو گەیشتنە ئەنجام. (٣) ووتارێکی مشتومڕی.
-argumentative *(adj.)*.

**Argus** (är'gəs), *n.* (١) دەعبایەکی زەبەلاحی سەدچاوانەیە پاسەوانی گوێرەکەیەکە " ئیۆ " ی ئاوبوو، و دوای کوشتنی چاوەکانی خراوەتە کلکی تاوسەوە (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) پاسەوانێکی ووریا؛ پاسەوان.
(٣) باڵندەیەکە لە تاوس دەچێت.

**Argus-eyed** (är'gəs-īd'), *adj.* ووریا؛ چاوتیژ؛ ووردبین.

**argyle** (är'gīl), *n.* (١) نەخش‌ونیگارێکی چنراوی شێوە ئەلماس.
(٢) گۆرەوییەکی نەخشداری وەها.

**aria** (ä'ri-ə, âr'i-ə), *n.* ئاوازێکی یەك کەسیی ئۆپێرا.

**Arian** (âr'i-ən, är'yən), *n. & adj.* = Aryan.

**Arian** (âr'i-ən), *adj. & n.* ئاریۆسی (دوو ووشەی دوای ئەمە ببینە).

**-arian** (âr'i-ən), پاشگرێکە بەمانای: (١) تەمەن: *(octogenarian)*.
(٢) لقێکی ئاینی: *( Unitarian)*.
(٣) بروا؛ بیروباوەڕ؛ ڕێباز: *(vegetarian)*.
(٤) پیشە.

**Arianism** (âr'i-ən-iz'm), *n.* بیروباوەڕی " ئاریۆس " ی قەشە کە دەڵێت: عیسا خودا نییە بەڵکو چاکترین گیاندارە.

**arid** (ar'id), *adj.* (١) ووشك؛ قڕج هەڵگەڕاو.
(٢) ڕووتەنی؛ بەکەڵکی کشتوکاڵ نەهاتوو؛ ووشکەڵان: *( ~ land)*.
(٣) ووشك و ناخۆش؛ مردوو (مەجاز).
-aridly *(adv.)*; aridness *(n.)*.

**aridity** (ə-rid'ə-ti), *n.* (١) ووشکێتی؛ ڕووتەنێتی؛ بێ بەرهەمی:
*( the ~ of the land)*
(٢) ووشکی؛ ناخۆشی؛ مردوویی (مەجاز): *( the ~ of their lives)*.

**Aries** (âr'ēz, âr'i-ēz'), *n.* بورجی کاوڕ؛ بورجی یەکەم؛ کەلووی کاوڕ.

**arietta, ariette** (ar'i-et'ə), *n.* ئاوازێکی کورت.

**aright** (ə-rīt'), *adv.* بە ڕاستی؛ بە تەواوی و ڕێك‌وپێکی:
*( to do something ~ )*

**aril** (ar'il), *n.* توێکڵی هەندێك تۆو.

**-arious** (âr'i-əs), پاشگرێکە بەمانای: تایبەتی بە؛ پەیوەندیدار؛ هەبوو: *(hilarious, vicarious, gregarious)*.

**arise** (ə-rīz'), *v.i.* (١) لە خەو هەڵسان؛ هەستان. (٢) بەرزبوونەوە.
(٣) پەیدابوون؛ دەرکەوتن؛ دەستپێکردن: *( a patch of cloud arose. ; Two men of genius arose among them.)*
(٤) ( ~ from )، لێوە پەیدابوون؛ لێوەهاتن یا ئەنجام بوون.

**aristocracy** (ar'ə-stok'rə-si), *n.* (١) ئەریستۆکراسی؛ ڕژێمی بەگزادەیی. (٢) بەگزادەنشین؛ وڵاتێك کە ئەم جۆرە ڕژێمەی هەبێت.
(٣) چینی شازادە یا بەگزادە.
(٤) دەستەی بەهرەداری نایاب: *( an ~ of brains)*.
(٥) نایابی؛ بەرزی؛ هەست بەرزی.

**aristocrat** (ə-ris'tə-krat', ar'is-tə-krat'), *n.* (١) بەگزادە؛ خانزادە؛ شازادە؛ ئەریستۆکرات. (٢) کەسێك کە کردەوەو خووو بیروباوەڕی بەگزادانە بێت؛ بەگزادە ناسا. (٣) لایەنگری ڕژێمی بەگزادەیی.

**aristocratic** (ə-ris'tə-krat'ik), *adj.* ئەریستۆکراتی؛ بەگزادەیی، یا خانزادەیی: (ا) لایەنگری ڕژێمی بەگزادەییە.
(ب) بۆ بەگزادە دەشێت؛ جوان و نایاب.
(ج) تایبەتی بە چینی بەگزادە.
(د) بەگزادانە (لەڕووی باشی یا خراپییەوە).
-aristocratical *(adj.)*; aristocratically *(adv.)*.

**Aristotelian** (ar'is-tə-tē'li-ən), *adj.* ئەرستۆیی؛ تایبەتی بە فەیلەسوفی کۆنی یۆنان " ئەرستۆ " و فەلسەفەکەی.
*n.* (١) پەیڕەویکەری " ئەرستۆ " و فەلسەفەکەی.
(٢) کەسێکی کردەنی؛ کەسێکی کردارخواز.
-Aristotelianism *(n.)*.

**Aristotle** (ar'is-tot''l), *n.* ئەرستۆ: فەیلەسوفی کۆنی یۆنانی.

**arithmetic** (ə-rith'mə-tik'), *n.* (١) زانستی ژمارە؛ ژمارە؛ ژمێرە.
(٢) بەهرەی ژمارە؛ ژمارە زانین: *( My ~ is poor.)*.
(٣) پەڕتووکی ژمارە.

**arithmetical** (ar'ith-met'i-k'l), *adj.* تایبەتی بە ژمارە؛ تایبەتی بە زانستی ژمارە.
-arithmetically *(adv.)*.

**arithmetician** (ə-rith'mə-tish'ən), *n.* زانای ژمارە؛ ژمارەزان.

**arithmetic mean,** ناوەندی ژمێرەیی؛ تێکڕای ژمێرەیی.

**arithmetic progression,** یەك بەدوای یەکی ژمارەیی: ڕیزە ژمارەیەکە کە زیاد دەکەن یا کەم دەکەن بە هەمان هەند یا ژمارە:
( 1, 2, 3, 4, 5 ; 11, 13, 9, 7, 5, 3 )

**ark** (ärk), *n.* (١) ئەو سنووقەی دە فەرمانەکەی خودای تێدا هەڵگیرابوو (ئاینی جوولەکە) (پێی دەووترێت: **ark of the covenant** )
(٢) کەشتی نووح. (٣) کەشتییەکی گەورە؛ کەشتی.
(٤) پەنا؛ حەشارگە. (٥) [Obs.]، سنووقی پارە.

**ark of the covenant,** ئەو سنووقەی دە فەرمانە لەسەر تەختەبەرد نووسراوەکەی خودای تێدا هەڵگیرابوو (ئاینی جوولەکە).

**arm** (ärm), *n.* (١) قۆڵ؛ باڵ؛ باسك.
(٢) لق (درەخت، ڕووبار)؛ پەل (گیاندار، درەخت).
(٣) (ا) قۆڵ (کراس، چاکەت، پاڵتۆ). (ب) قۆڵی کورسی.
(٤) دەست؛ دەسەلات: *( the long ~ of the law)*.
(٥) شتێکی وەك قۆڵ یا باڵ: *( an ~ of the sea ; the ~ of a balance ; the ~ of a phonograph ; an ~ of the government)*
**the arm of the law.** دەسەلات یا دەستی یاسا.
**arm in arm,** قۆڵ لەناو قۆڵدا؛ شان بە شانی یەکتر.
**keep at arm's length,** دوورەپەرێز گرتن؛ ڕێگەی نزیکبوونەوەو دۆستایەتی نەدان.
**receive (or welcome) with open arms,** بە گەرمی بەخێرهاتن کردن.

**arm** (ärm), *n.* (١) چەك.
(٢) لقێکی سوپا (وەك تۆپ هاوێژ، پیادە... هتد).
*v.t.* (١) چەك پێدان؛ چەکدارکردن؛ پڕچەك کردن.
(٢) پێدانی ئامێر یا شتی پێویست بۆ جێبەجێکردنی کارێك:
*( to ~ someone with faith)*
(٣) بەهێزکردن؛ پاراستن.
*v.i.* چەك کردنە شان؛ خۆ چەکدارکردن؛ چەك هەڵگرتن.
**bear arms,** سەربازی کردن؛ بوون بە سەرباز.
**coat of arms,** درووشمی خانەدانی، بەگزادەیی، یا سوارچاکی (کە بریتییە لە چەند وێنەیەکی تایبەت بە خێڵێك کە دەدرێت لە قەڵغانی ئەندام و سوارچاکانی ئەو خێڵە)؛ درووشمی تایبەتی دەزگایەکی زانستی یا کۆمەڵایەتی.
**take up arms,** چەك هەڵگرتن؛ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ.
**under arms,** لەژێر چەکدا؛ چەکدارن و ئامادەن بۆ جەنگ.

**up in arms,** (١) یاخی

(٢) زۆر نارازی: ***( The people are up in arms against him.)*** .

**armada** (är-mä′də, är-mā′də), ***n.*** (١) گەلە کەشتی جەنگ.

(٢) [-A]، گەلە کەشتییەکی جەنگی ئیسپانیایی بوو کە نێردرا بۆ جەنگ دژی ئینگلتەرە سالی ١٥٨٨، بەلام گەرداو و گەلە کەشتی جەنگی ئینگلیزی زۆربەی فەوتان و لەناوبرد. (٣) گەلە فڕۆکەی جەنگی.

**armadillo** (är′mə-dil′ō), ***n.*** ئارمەدیلۆ گیانداڕێکی بچووکی قەلغانداری خاك هەلکەنەری شیردەرە.

**Armageddon** (är′mə-ged′′n), ***n.*** (١) جێگەی دوا جەنگی نێوان هێزی باش و خراپ لەپێش ڕۆژی قیامەتدا (ئینجیل).

(٢) جەنگێکی گەورەی یەکلاییکەرەوە.

**armament** (är′mə-mənt), ***n.*** (١) (*pl.*)، هەموو چەك و هێزی چەکداری ولاتێك. (٢) هەموو چەکی کەشتی و فڕۆکەی جەنگی، دەبابە، یا قەلایەك (٣) چەکدارکردن؛ چەك هەلگرتن و ئامادەبوون بۆ جەنگ.

**armature** (är′mə-chēr), ***n.*** (١) قەلغان؛ زرێ.

(٢) بەرگ و توێکلی قەلغانی هەندێك گیاندار و ڕووەك؛ قاوغ.

(٣) ئارمێچەر (ئۆتۆمبیل). (٤) پارێزەری مووگناتیس.

**armchair** (ärm′châr′), ***n.*** کورسی قۆلدار

**armed** (ärmd), ***adj.*** چەکدار؛ چەك لە شان؛ چەك هەلگر.

**armed** (ärmd), ***adj.*** قۆلدار؛ باڵدار ***( a long- ~ man)*** .

**armed forces,** هێزە چەکدارەکان (سوپا، هێزی دەریایی و ئاسمانی)؛ هێزی چەکدار.

**Armenian** (är-mē′ni-ən, är-mēn′yən), ***adj.*** ئەرمەنی (گەل، زمان، کلتوور)

***n.*** (١) ئەرمەنی؛ کەسێکی ئەرمەنی. (٢) زمانی ئەرمەنی.

**armful** (ärm′fool′), ***n.*** باوەشێك؛ پڕ باوەش.

**armhole** (ärm′hōl′), ***n.*** کونەقۆلی جل و بەرگ.

**armiger** (är′mi-jēr), ***n.*** (١) قەلغان بۆ هەلگر یا بەردەستی سوارچاك.

(٢) کەسێکی یەك پلە لەخوار سوارچاکەوە.

**armillary** (är′mi-ler′i, är-mil′ēr-i), ***adj.*** (١) بازنەیی؛ ئەلقەیی؛ خڕ (٢) ئەلقە ئەلقە.

**armipotent** (är-mip′ə-tənt), ***adj.*** ئازا (جەنگ)؛ قارەمان

**armistice** (är′mə-stis), ***n.*** پەیمانی شەڕ وەستان؛ جەنگ وەستان.

**Armistice Day,** یادی وەستانی جەنگی جیهانیی یەکەم لە یانزەی نۆڤمبەری ١٩١٨ دا (پێشی دەوترێت: **Veterans' Day**).

**armoire** (är-mwär′), ***n.*** دۆلابێکی گەورەی بە نەخش و نیگار ڕازاوە.

**armor** (är′mēr), ***n.*** (١) قەلغان؛ زرێ

(٢) قاوغی ڕەقی گیاندار

(٣) تەبەقی کانزایی کە لە کەشتی و فڕۆکەی جەنگی ئەدرێت بۆ پاراستنیان.

(٤) هێزی زرێداری سوپا.

***v.t. & v.i.*** قەلغان کردنە بەر؛ زرێ لەخۆدان؛ قەلغان لێدان.

**armorbearer** (är′mēr-bâr′ēr), ***n.*** هەلگری قەلغان و چەکی سوارچاك

**armor-clad** (är′mēr-klad′), ***adj.*** زرێ پۆش؛ زرێدار؛ قەلغاندار.

**armored** (är′mērd), ***adj.*** (١) قەلغان لەبەر؛ زرێ لەبەر؛ زرێ پۆش.

(٢) زرێدار (سوپا، هۆی گواستنەوە): ***( an ~ division, vehicle, etc.)*** .

**armored car,** زرێ پۆش (سوپا، پارە گواستنەوە)؛ زرێدار.

**armored force,** هێزی زرێداری سوپا.

**armorer, armourer** (är′mēr-ēr), ***n.*** (١) چەخماخساز؛ درووستکەر و چاککەرەوەی قەلغان و چەك.

(٢) سەربازی چاککەرەوە و پاککەرەوەی چەك.

**armorial** (är-môr′i-əl, är-mō′ri-əl), ***adj.*** تایبەتی بە درووشمی سوارچاکی

**armory, armoury** (är′mēr-i), ***n.*** (١) جبەخانە؛ چەکخانە.

(٢) بارەگای لقێکی هێزی بەرگری میللی. (٣) کارخانەی چەك.

**armour** (är′mēr), ***n.*** = **armor.**

**armourer** (är′mēr-ēr), ***n.*** = **armorer.**

**armoury** (är′mēr-i), ***n.*** = **armory.**

**armpit** (ärm′pit′), ***n.*** بن باخەل؛ بن قۆل؛ بن هەنگل.

**arms** (ärmz), ***n.pl.*** (١) چەك؛ چەکەکان. (٢) جەنگ؛ شەڕ

(٣) درووشمی سوارچاکی.

(٤) نیشانە یا درووشمی ولات و کۆمپانیا ... هتد.

**bear arms,** (١) چەك هەلگرتن. (٢) لە هێزی چەکداردا بوون.

**carry arms,** چەك هەلگرتن.

**take up arms,** شۆڕش بەرپاکردن؛ شەڕ هەلگیرسان؛ چەك هەلگرتن.

**to arms!** چەك هەلگرن!؛ ئامادەی جەنگ بن!

**under arms,** چەکدارن؛ ئامادەن بۆ جەنگ؛ چەك لە شان.

**up in arms,** (١) جەنگ ئامادە؛ ئامادەی شەڕن (٢) تووڕە.

**army** (är′mi), ***n.*** (١) سوپا؛ لەشکر.

(٢) [-A]، ڕێکخراوێکی گەورە: ***( the Salvation A~ )*** .

(٣) ژمارەیەکی زۆر (مرۆڤ، زیندەوەر):

***( the ~ of the unemployed ; an ~ of insects)***

**army of occupation,** لەشکری داگیرکەر.

**aroma** (ə-rō′mə), ***n.*** (١) بۆن و بەرامە؛ بۆنێکی خۆش (خواردەمەنی، ڕووەك، داو و دەرمان). (٢) هەستێکی تایبەتی بە شوێنێك.

**aromatic** (ar′ə-mat′ik), ***adj.*** بە بۆن و بەرامە؛ بۆنخۆش؛ بۆندار.

***n.*** شتێکی بۆنخۆش (ڕووەك، دەرمان)؛ شتێکی بە بۆن و بەرامە.

**aromatize** (ə-rō′mə-tīz′), ***v.t.*** بۆنخۆش کردن؛ بۆن و بەرامە پێدان.

**arose** (ə-rōz′), *past tense of* **arise.**

**around** (ə-round′), ***adv. & prep.*** (١) دەوروپشت؛ بەدەوروپشتیدا؛ بەدەوریدا؛ لەملا و لەولایەوە.

(٢) لە گەلێك شوێن؛ لێرە و لەوێ: ***( to travel ~ )*** .

(٣) [Colloq.]، نزیك (جێگە): ***( Stay ~ . )*** .

(٤) نزیکەی؛ نزیکی: ***( ~ five dollars ; ~ 1950)*** .

**fool around,** (١) خۆخلافاندن؛ کات کوشتن؛ کات بەفیڕۆدان.

(٢) [Colloq.]: چاوباشقانی کردن؛ لەگەل گەلێك کەسدا جووت بوون.

**have been around,** شارەزا؛ سەردەرچوو؛ بزان؛ دنیادیدە.

**around the clock,** شەو و ڕۆژ؛ بیست و چوار سەعات.

**arouse** (ə-rouz′), ***v.t.*** (١) هەست جوولاندن؛ هێنانەجۆش؛ بزواندن؛ هەوەس هەلساندن (جووت بوون):

***( His behavior ~d suspicion. ; He ~d her.)***

(٢) لە خەو هەلساندن؛ خەبەرکردنەوە.

**arrack** (ar′ək), ***n.*** عەرەق (خواردنەوە).

**arraign** (ə-rān′), ***v.t.*** لێکۆلینەوەی دادگایی؛ لێپرسینەوەی سەرەتایی لە گومانبارێك.

***n.*** لێکۆلینەوەی دادگایی.

**arraignment** (ə-rān′mənt), ***n.*** لێپرسینەوەی سەرەتایی دادگا لە گومانبارێك؛ لێکۆلینەوەی دادگایی.

**arrange** (ə-rānj′), ***v.t.*** (١) ڕێکخستن؛ ڕێك و پێك کردن؛ ڕیزکردن.

(٢) پۆل پۆل کردن.

(٣) بڕینەوە (ناکۆکی)؛ بەلایەکدا خستن؛ جێبەجێکردن.

(٤) گونجاندنی پارچەیەك مۆسیقا.

***v.i.*** (١) ڕێکەوتن لەسەر.

(٢) نەخشە بۆ کێشان؛ ئامادەکردن: ***( Can you ~ for a meeting?)***

(٣) گونجان یا گۆڕینی پارچەیەك مۆسیقا.

**arrangement** (ə-rānj′mənt), ***n.*** (١) ڕێکخستن؛ ڕێك و پێك کردن.

(٢) چۆنێتی ڕێکخستن؛ ئەنجامی ڕێکخستن؛ ڕێکخراو: ***( a floral ~ )***

(٣) (*pl.*)، پلان؛ ئامادەیی؛ خۆ ئامادەکردن:

***( A~s have been made for the party.)***

(٤) ڕێکەوتن (ناکۆکی).

(٥) (ا) گونجانی پارچەیەك مۆسیقا لەگەڵ ئامێری مۆسیقاو دەنگدا.
(ب) پارچە مۆسیقایەكی وەها گونجاو.

**arrant** (ar′ənt), *adj.* (١) تەواو؛ بەتەواوی؛ سەراپا:
*( an ~ fool, knave, liar, etc.)*
(٢) [Obs.]، گەڕۆك؛ ئاوارە

**arras** (ar′əs), *n.* (١) قوماشی زەركەش یا نەخش‌ونیگاراوی سەردیوار.
(٢) پەردە

**array** (ə-rā′), *v.t.* (١) ڕیزكردن (سەربان)؛ ڕێكخستن.
(٢) خۆ ڕازاندنەوە؛ جلی جوان لەبەركردن.
*n.* (١) ڕیز (لەشكر)
(٢) ڕێكخستن یا دەستەدەستەكردن (لەشكر): *( in battle ~ )* .
(٣) كۆمەڵێك كەس یا شتی سەرنج ڕاكێش:
*( an ~ of weapons, clothes, gems, actors, politicians, etc.)*
(٤) جل‌وبەرگی جوان.

**arrears** (ə-rêz′), *n.pl.* (١) قەرزی نەدراوە لە كاتی خۆیدا؛ قەرزی دواكەوتوو (٢) كاروباری تەواو نەكراو لە كاتی خۆیدا؛ ئەركی بەجێ نەهێنراو.
**in arrears (or arrear),** دواكەوتوو لە دانەوەی قەرزێكدا یا بەجێهێنانی ئەركێك: *( He was in arrears with his rent, payment, etc.)* .

**arrest** (ə-rest′), *v.t.* (١) بەربەست كردن؛ وەستاندن؛ ڕێگەگرتن؛ ڕێگەی بڵاوبوونەوە نەدان: *( The infection has been ~ed.)* .
(٢) گرتن (لەلایەن پۆلیسەوە)؛ گرتن‌و خستنە بەندیخانەوە.
(٣) سەرنج ڕاكێشان‌و ڕاگرتن.
*n.* (١) گرتن؛ گیران‌و خرانە بەندیخانەوە:
*( An order was issued for his ~ .)*
(٢) وەستێنەر (ئامێر).
**under arrest,** گیراو (لەلایەن پۆلیسەوە).

**arresting** (ə-res′tiŋ), *adj.* جوان‌و سەرنج ڕاكێش؛ سەیر

**arrhythmia** (ə-rith′mi-ə, ə-rith′mi-ə), *n.* ناڕێك‌وپێكی لێدانی دڵ

**arrhythmic** (ə-rith′mik, ə-rith′mik), *adj.* ناڕێك‌وپێك (لێدانی دڵ).

**arrival** (ə-rīv′'l), *n.* (١) گەیشتن (شوێن)؛ گەیین:
*( the time of ~ )*
(٢) گەیشتوو (مرۆڤ، شت):
*( There were several new ~s at the hotel.)*
(٣) گەیشتنە ئەنجام.

**arrive** (ə-rīv′), *v.i.* (١) گەیشتن (شوێن)؛ گەیین؛ هاتن:
*( We ~d in London last week. ; They ~d home yesterday.)*
(٢) هاتن (كات): *( The time has ~d for action.)* .
(٣) گەیشتنە ئەنجام یا ڕێكەوتن:
*( to ~ at a conclusion, impass, an agreement, etc.)*
(٤) سەركەوتن؛ بە ئامانج گەیشتن: *( He has ~d professionally.)* .
**arrive at,** (١) گەیشتن (شوێن). (٢) گەیشتنە ئەنجام.

**arroba** (är-rō′bä), *n.* كێشەیەكی ئیسپانی كۆنە.

**arrogance** (ar′ə-gəns), *n.* لووت بەرزی؛ لەخۆباییتی؛ فیز.

**arrogant** (ar′ə-gənt), *adj.* لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ بەفیز؛ كەشخەچی.
**-arrogantly** *(adv.).*

**arrogate** (ar′ə-gāt′), *v.t.* (١) دەست بەسەرداگرتن بە ناڕەوایی؛ كردن بە هی خۆ بە ناهەق. (٢) دانەپاڵ بە ناڕەوایی.
**-arrogation** *(n.)*; **arrogator** *(n.).*

**arrow** (ar′ō), *n.* (١) تیر (٢) نیشانەی ڕێگە پیشاندان ( ← ).

**arrowhead** (ar′ō-hed′), *n.* (١) سەرەتیر؛ سەرتیر
(٢) نیشانەی سەرچاوەی ووشە لە فەرهەنگدا ( > ) .
(٣) ڕووەكێكە گەڵاكانی لە تیر دەچن.

**arroyo** (ə-roi′ō), *n.* (١) چەمێكی ووشك.
(٢) جۆگە؛ ڕووبارێكی بچووك.

**arse** (ärs), *n.* سمت (ووشەیەكی سووكە)؛ گووپی قنگ.

**arsenal** (är′s'n-əl, är′snəl), *n.* جبەخانە؛ كارخانەی چەك.

**arsenate** (är′s'n-āt′, är′s'n-it), *n.* زەڕنیخ؛ مەرگەمووش.

**arsenic** (är′s'n-ik, är′snik), *n.* زەڕنیخ؛ مەرگەمووش.
*adj.* زەڕنیخی؛ تایبەتی بە زەڕنیخ.
**-arsenical** *(adj.).*

**arsenous** (är′s'n-əs), *adj.* زەڕنیخاوی.

**arson** (är′s'n), *n.* سووتاندنی دەسەنقەست (خانوو، دەشت‌ودەر)؛ ئاگرتێبەردانی دەسەنقەست.

**arsonist** (är′s'n-ist), *n.* ئاگرتێبەردەری دەسەنقەست؛ سوتێنەری دەسەنقەست.

**art** (ärt), *n.* (١) بەهرە؛ كارامەیی؛ دانایی.
(٢) هونەر (نیگاركێشی، پەیكەرسازی، مۆسیقا، شانۆ، سەما... هتد)؛ هونەرە جوانەكان. (٣) نیگاركێشی؛ پەیكەرسازی؛ بەرهەمی ئەم هونەرانە.
(٤) (*pl.*)، ئەدەبیات؛ ئەو بەشانەی زانست كە پەیوەندی‌یان بە هونەرو ویژەوە هەیە: *( college of A~s)* .
(٥) پیشە؛ پیشەگەری: *( the cobbler's ~ )* .
(٦) شێوەی كردن؛ بنچینە: *( the ~ of composition)* .
(٧) زۆرزانی؛ فێڵ؛ فێڵبازی.

**art** (ärt), شێوەی كۆنی " **are** " ە.

**artel** (är-tel′), *n.* كۆمەڵی هەرەوەز.

**art gallery,** پیشانگای نیگاركێشی.

**arterial** (är-têr′i-əl), *adj.* (١) شادەماری.
(٢) تایبەتی بە خوێنی ناو شادەمار (كە پاك كراوەتەوە پڕە لە ئۆكسجین).
(٣) شاڕێیی.

**artery** (är′tēr-i), *n.* (١) شادەماری خوێنبەر؛ خوێنبەر؛ شادەمار.
(٢) شاڕێ: *( a railroad ~ )* .

**artesian well,** بیری ئێرتیوازی.

**artful** (ärt′fəl), *adj.* (١) دەستكرد؛ لاساییكەرەوە.
(٢) دانا؛ زیرەك؛ زۆرزان. (٣) فێڵباز؛ زۆڵ؛ ساختەچی.
(٤) [Archaic]، زۆر كارامە.
**-artfully** *(adv.).*

**arthritic** (är-thrit′ik), *adj.* (١) بادار؛ جومگە ئاوساو؛ باداری هەیە:
*( an ~ joint, person, etc.)*
(٢) تایبەتی بە باداری.

**arthritis** (är-thrī′tis), *n.* نەخۆشی هەوكردنی جومگە؛ باداری؛ جومگە ئاوسان.

**arthro-** (är′thrō, är′thrə), پێشگرێكە بەمانای: جومگە.

**arthropod** (är′thrə-pod′), *n.* زیندەوەری جومگەدار: جۆرە زیندەوەرێكی بێ بڕبڕەی جومگەداری لەش بەش بەشە (وەك جاڵجاڵۆكە، دووپشك، هەزارپێ... هتد)

**artichoke** (är′ti-chōk′), *n.* (١) ڕووەكێكی دڕكاوی‌یە وەك كنگر.
(٢) سەوزەبەری ئەم ڕووەكە (كە بریتی‌یە لە تۆپەڵێكی گەڵا گەڵا كە بە كوڵاوی دەخورێت).

**article** (är′ti-k'l), *n.* (١) بەند (پەیمان، دەستوور، بڕوانامە):
*( the ~s of a treaty, constitution, etc.)*
(٢) ووتارێكی نووسراو (لە ڕۆژنامە، گۆڤار، یا پەڕتووكێكدا)؛ زانستنامە.
(٣) پارچە؛ دانە (شت): *( an ~ of luggage, clothing, etc.)* .
(٤) فرۆتەنی؛ شتوومەكی فرۆشتن.
(٥) ئامراز (ڕێزمان):
*( A and an are definite ~s, and the is a definite ~ .)*
(٦) بەشێكی ئەندامی جومگەدار (زیندەوەرناسی).
*v.t.* (١) پیشاندان بە بەند بەند. (٢) تاوانباركردن.
(٣) بەستنەوە بە ڕێكەوتن یا قۆنتەراتێكەوە:

*( to ~ a seaman for a voyage)*
**articular** (är-tik′yoo-lẽr), *adj.* جومگەیی
**articulate** (är-tik′yoo-lit), *adj.* (١) جومگەدار
(٢) بە ڕوونی بێژراو؛ بە ڕوونی ووتراو.
(٣) ڕەوانبێژ؛ زمانپاراو؛ بە دەموپل
(٤) ڕوون؛ بە ڕوونی و باشی دەربڕاو: *( an ~ argument)* .
*v.t.* (١) بە جومگە پێکەوەبەستن. (٢) بە ڕوونی بێژان؛ دان پیانان (ووتووێژ).
(٣) بە ڕوونی دەربڕین؛ بەبێ پێچ‌وپەنا ڕوونکردنەوە
(٤) بێژان؛ ووتن (دەنگسازی): *( to ~ a sound)* .
*v.i.* (١) بە ڕوونی بێژان (٢) بە جومگە پێکەوەبەستران
(٣) بێژان؛ ووتن (دەنگسازی).
-articulately *(adv.)*; articulateness *(n.)*.
**articulation** (är-tik′yoo-lā′shən), *n.* (١) پێکەوەبەستن یا بەستران بە جومگە (٢) شێوەی ئەم پێکەوەبەستنە
(٣) بێژان بە ڕوونی؛ دان پیانان (ئاخاوتن).
(٤) بێژان؛ ووتن. (٥) دەنگ (بەتایبەتی هی تیپی نابزوێن).
(٦) جومگە (٧) جومگەی ڕووەك
(٨) جوولەی ئەندامی بێژان.
**articulator** (är-tik′yoo-lā′tẽr), *n.* (١) بێژەر؛ دەربڕ
(٢) ئەندامی بێژان (لێو، زمان... هتد).
**artifact** (är′ti-fakt′), *n.* بەرهەمێکی دەستکرد؛ دروستکراوێکی هونەری
**artifice** (är′tə-fis), *n.* (١) کارامەیی؛ زیرەکی؛ دانایی.
(٢) فێڵبازی؛ فێڵ؛ زۆڵی
(٣) ئامێرێکی نایاب و ئەنتیکە؛ هۆ یا ڕێگەیەکی دانایانە.
**artificer** (är-tif′ə-sẽr), *n.* (١) پیشەگەرێکی دانا یا کارامە.
(٢) داهێنەر (٣) مەکینەچی سوپا؛ فیتەرچی سوپا.
**artificial** (är′tə-fish′əl), *adj.* (١) دەستکرد؛ دروستکراو؛
وێنەی لاسایی: *( ~ flowers, teeth, light, etc.)* .
(٢) درۆ؛ ڕووکەش؛ هەر لەڕوو: *( an ~ smile)* .
(٣) خۆماڵی نییە (ڕووەك).
**artificial insemination,** جووت کردن یا چاك کردنی دەستکرد.
**artificiality** (är′tə-fish′i-al′ə-ti), *n.* (١) ڕووکەشیتی؛ درۆزنەیی؛ سەرزارێتی؛ درۆ. (٢) دەستکردی؛ دروستکراوی.
(٣) شتێکی دەستکرد؛ شتێکی درۆزنە یا ڕووکەش
-artificially *(adv.)*.
**artificial respiration,** هەناسەپێدانی دەستکرد
**artillery** (är-til′ẽr-i), *n.* (١) تۆپ؛ تۆپ هاوێژ
(٢) زانستی تۆپ و تۆپ تەقاندن.
**the artillery,** هێزی تۆپ هاوێژ
**artilleryman** (är-til′ẽr-i-mən), *n.* سەربازی هێزی تۆپخانە؛ تۆپچی.
**artisan** (är′tə-z′n), *n.* پیشەگەر؛ پیشەساز؛ وەستا.
**artist** (är′tist), *n.* (١) هونەرمەند؛ نیگارکێش؛ وێنەکێش؛ هونەرکار.
(٢) کەسێکی دەستباڵاو کارامە لە پیشەیەکدا: *( This cook is an ~ . )* .
(٣) سەماکەر؛ گۆرانی بێژ
**artiste** (är-tēst′), *n.* سەماکەر؛ گۆرانی بێژ.
**artistic** (är-tis′tik), *adj.* (١) هونەری؛ تایبەتی بە هونەر:
*( the ~ aspect)*
(٢) جوان و ڕێك‌وپێك؛ بە جوانی کراو.
(٣) هونەرخواز؛ حەزکەر لە هونەر؛ زەوق جوان؛ هونەرزان: *( an ~ person)* .
**artistically** (är-tis′ti-k′l-i, är-tis′tik-li), *adv.* (١) لەڕووی هونەرەوە (٢) هونەرمەندانە؛ بە جوانی و ڕێك‌وپێکی و دڵگیری.
**artistry** (är′tis-tri), *n.* هونەرکاری؛ توانا و پیشەی هونەرمەند؛ هونەرمەندێتی.

**artless** (ärt′lis), *adj.* (١) نەزان؛ هیچ نەزان (٢) ناتۆڵا؛ ناکارامە.
(٣) سادە؛ خاکی؛ سرووشتی (٤) ساویلکە.
**arty** (är′ti), *adj.* [Colloq.], خۆنواندن بە هونەرمەند؛ زۆر خۆدەرخەر بە هونەرمەند
**-ary** (er′i), پاشگرێکە بەمانای هی؛ تایبەتی بە:
*(dictionary, parliamentary, missionary)*
**Aryan** (är′i-ən, är′yən), *adj.* (١) تایبەتی بە زمانە هیندۆ-ئەورووپییەکان. (٢) تایبەتی بە لقی هیندی-ئێرانی لە زمانە هیندۆ-ئەورووپییەکان (کە زمانی هیندی، سانسکریتی، فارسی، کوردی) دەگرێتەوە
(٣) ئاری؛ تایبەتی بە ڕەگەزی ئاری.
*n.* (١) بنچینە زمانی زمانە هیندۆ- ئەورووپییەکان.
(٢) ئاری؛ وەچەی ئاری.
**as** (az; *unstressed*, əz), *adv.* (١) ئەوەندەی یەکتر؛ وەکو یەك:
*( I am ~ good ~ he.)*
(٢) وەك؛ وەکو؛ بۆ نموونە.
*conj.* (١) وەك؛ وەکو؛ هەر وەکو: *( It flew straight ~ an arrow.)* .
(٢) وەك؛ چۆن؛ وەکو؛ بە هەمان شێوە: *( Do ~ you are told.)* .
(٣) لە هەمان کاتدا کە؛ لەو کاتەدا کە: *( She arrived ~ I was leaving.)*
(٤) چونکە؛ لەبەرئەوە: *( A~ you object, we won't go.)* .
(٥) هەرچەند؛ ئەگەرچی:
*( Tall ~ he was, he couldn't reach the apples.)*
*pron.* (١) وەك؛ وەکو: *( He is tired, ~ anyone can see.)* .
(٢) کە: *[ This is the same color ~ yours (is) . ]* .
*prep.* وەك: *( He poses ~ a friend.)* .
as a rule, بە ئاسایی؛ بە شێوەیەکی گشتی.
as... as, چوونیەك؛ ئەوەندەی یەکتر:
*( as large as, as heavy as, as much as, as good as, as far as, as many as)*
as far as, ئەوەندەی کە:
*( As far as I'm concerned, it's all right.)*
as for, دەربارەی.
as good as, وەك؛ وەك ئەوە وایە؛ وەك یەکن.
as if, وەکو؛ هەر وەك؛ دەڵێی؛ گوایە
as is, [Slang], چۆنە هەر وەها.
as it were, چۆن دەڵێی؛ هەر وەك چۆن دەڵێیت
as long as, هەتا؛ هەتاکو:
*( as long as I live)*
as much as, ئەوەندەی.
as much as possible, بەپێی توانا؛ بەگوێرەی توانا
as of, لە (کاتێکی تایبەتییەوە).
as soon as, هەر کە؛ یەکسەر کە.
as soon as possible, بە زووترین کات.
as regards, دەربارەی.
as respects, دەربارەی.
as though, دەڵێی.
as to, دەربارەی.
as well, هەروەها؛ یش.
as well as, هەروەها؛ - یش.
as yet, تا ئێستا؛ هەتا ئێستا.
**as** (as), *n.* (١) پێوانەو کێشەیەکی ڕۆمانی کۆنە.
(٢) پارەیەکی ڕۆمانی کۆنە
**ascarid** (as′kə-rid), *n.* ئەسکارس؛ کرمی ڕیخۆڵە.
**ascend** (ə-send′), *v.i.* (١) بەرزبوونەوە؛ سەرکەوتن
(٢) پلە بەرزبوونەوە.
(٣) لێژبوون؛ بە لێژایی چوونە سەرەوە: *( The path ~s here.)* .

(٤) بەرزبوونەوە لە ئاسۆوە بۆ ناوەڕاستی ئاسمان (مانگ، ڕۆژ... هتد).
*v.t.* (١) پێدا هەڵگەڕان؛ پێدا سەرکەوتن: *( to ~ a hill, the stairs, etc.)*.
(٢) چوونە سەر تەخت. *( to ~ the throne)*.
**ascendance** (ə-sen′dəns), *n.* = ascendancy.
**ascendancy** (ə-sen′dən-si), *n.* بەرزبوونەوە (پلەوپایە)؛ دەسەڵات زۆربوون
**ascendant** (ə-sen′dənt), *adj.* (١) لە بەرزبوونەوەدایە.
(٢) زاڵ؛ دەسەڵات
*n.* (١) بورجی بەرزبووەوە (نیشانەی بەختەوەرییە) (ئەستێرەناسی).
(٢) زاڵی؛ دەسەڵات (٣) [Rare]، باوروباپیر
in the ascendant, لە بەرزبوونەوەدایە (پلەوپایەی مرۆڤ)؛ هەتا دێت دەسەڵاتی زیاد دەکات و بەناوبانگ دەبێت.
**ascending** (ə-sen′diŋ), *adj.* بەرزبووەوە؛ بەرزدەبێتەوە.
*( in an ~ order)*
**ascension** (ə-sen′shən), *n.* (١) بەرزبوونەوە؛ سەرکەوتن.
(٢) چوونەسەر تەختی پاشایی *( his ~ to the throne)*.
(٣) [A-]. بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان (چل شەو پاش هەڵواسینی).
(٤) [A-]. دوورگەیەکە لە خوارووی زەریای ئەتڵەسی.
-ascensional *(adj.)*.
**Ascension Day**, جەژنی بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان.
**ascent** (ə-sent′), *n.* (١) بەرزبوونەوە؛ سەرکەوتن.
(٢) پلەوپایە بەرزبوونەوە: *( His ~ to power was rather swift.)*.
(٣) پیاداسەرکەوتن؛ پیاداهەڵگەڕان:
*( The ~ of the mountain wasn't difficult.)*
(٤) سەربەرەوژوورکە؛ لێژگە.
(٥) پلەی لێژی: *( an ~ of three degrees)*
(٦) گەڕانەوە بۆ ڕابوردوو یا بنەچەی ڕەگەز.
**ascertain** (as′ẽr-tān′), *v.t.* بۆ دەرکەوتن بە لێکۆڵینەوە؛ ساغ کردنەوە؛ خۆ دڵنیاکردن:
*( It is difficult to ~ what really happened.)*
-ascertainment *(n.)*.
**ascertainable** (as′ẽr-tān′ə-b'l), *adj.* ساغ دەکرێتەوە (ڕاستی و درۆی شتێك).
**ascetic** (ə-set′ik), *adj.* وەك سۆفی؛ تایبەتی بە سۆفی؛ سۆفییانە:
*( He leads an ~ life.)*
*n.* سۆفی؛ کەسێك کە بە سادەیی بژی و خێروخۆشی دنیای نەوێت.
**ascetically** (ə-set′i-k'l-i, ə-set′ik-li), *adv.* (١) سۆفییانە.
(٢) لەڕووی سۆفیتییەوە
**asceticism** (ə-set′ə-siz'm), *n.* سۆفیتی؛ ژیانی سۆفیتی؛ نەویستنی خێروخۆشی دنیا
**Asclepius** (as-klē′pi-əs), *n.* ئەسکلیپیۆس خودای پزیشکەوانی (ئەفسانەی یۆنانی).
**ascorbic acid**, = Vitamin "C".
**ascot** (as′kət), *n.* جۆرە بۆینباخێکی گۆ گەورە یا دەستەسڕێکی گۆ گەورەی ملە.
**ascribable** (ə-skrīb′ə-b'l), *adj.* سەرچاوەکەی دەزانرێت؛ دەتوانرێت بدرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك.
**ascribe** (ə-skrīb′), *v.t.* دانەپاڵ کەسێك؛ خستنەمل شتێك یا کەسێك؛ سەرچاوە دیاری کردن:
*( He ~d his failure to ill-health. ;*
*This play is sometimes ~d to Shakespeare.)*
**ascription** (ə-skrip′shən), *n.* هۆ خستنەمل کەسێك یا شتێك؛ دانەپاڵ کەسێك.
**asepsis** (ə-sep′sis, ā-sep′sis), *n.* (١) پاکی؛ خاوێن لە میکرۆب.
(٢) شێوەی پاکژکردنەوە لە میکرۆب؛ خاوێن کردن؛ پاکردنەوە.
**aseptic** (ə-sep′tik, ā-sep′tik), *adj.* پاکژکراوە (لە میکرۆب)؛ پاکراوە؛ خاوێن کراو.
*n.* میکرۆب کوژ؛ ماددەی پاکژکەرەوە یا خاوێنکەر.
-aseptically *(adv.)*.
**asexual** (ā-sek′shōō-əl), *adj.* (١) بێ ئەندامی نێرو مێ یا زاوزێ.
(٢) (أ) بێ هەوەسی جووت بوون.
(ب) بێ پەیوەندی بە جووت بوونەوە: *( an ~ relationship)*.
(٣) زاوزێ دەکەن بەبێ جووت بوون (زیندەوەرناسی)؛ زۆر دەبن بەبێ لێکدانی نێرو مێ.
-asexuality *(n.)*.
**ash** (ash), *n.* (١) خۆڵەمێش؛ سووتوو (جگەرە).
(٢) خۆڵەمێشی؛ ڕەنگ خۆڵەمێشی؛ دێز.
(٣) *(pl.)*، خاکوخۆڵ (ڕاستی یا مەجاز):
*( A number of houses were burnt to ~es.)*
(٤) *(pl.)*، پاشماوەی لاشەی مردوو پاش سووتاندنی.
(٥) خۆڵەمێشی ئاگرڕێژێن.
**ash** (ash), *n.* (١) ڕەشەدار؛ جۆرە درەختێکە.
(٢) دارو تەختەی ئەم درەختە.
**ashamed** (ə-shāmd′), *adj.* شەرمەزار؛ خەجاڵەت؛ ڕووڕەش.
**ash can**, تەنەکەی خۆڵ.
**ashen** (ash′'n), *adj.* (١) تایبەتی بە خۆڵەمێش؛ خۆڵەمێشی.
(٢) خۆڵەمێشی (ڕەنگ)؛ ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاو؛ ڕەنگ مردوو.
**ashen** (ash′'n), *adj.* (١) تایبەتی بە درەختی " ئاش ".
(٢) لە داری ئەم درەختە دروستکراوە.
**ashes** (ash′iz), *n.pl.* (١) وێرانە (بەهۆی سووتاندنەوە)؛ کەلاوە.
(٢) پاشماوەی لاشەی مردوو پاش سووتاندنی (بە دەستووری ئاینی هیندی).
(٣) لاشە.
**ashlar, ashler** (ash′lẽr), *n.* (١) بەردی چوارگۆشەیی (بۆ خانوو دروستکردن). (٢) خانوو دروستکردن بەم جۆرە بەردە.
**ashman** (ash′man′), *n.* خۆڵڕێژ.
**ashore** (ə-shôr′, ə-shōr′), *adv. & adj.* (١) لە کەناری دەریا؛ بۆ کەناری دەریا: *( The boat was swept ~ .)*.
(٢) ناوشار: *( We went ~ at every port.)*.
**ashram** (ash′ram′), *n.* پەرستگایەکی هیندی: پەرستگا و خانەی قەلەندەرێکی هیندی و شوێنکەوتووەکانی؛ قەلەندەرگا.
**ash tray**, تەپلەکی جگەرە.
**Ash Wednesday**, چوارشەممەی خۆڵەمێشی: یەکەم ڕۆژی- بە ڕۆژووبوونە لای خاچ پەرستان (لە خۆڵەمێش لە ناوچەوان دانەوە هاتووە بۆ تۆبەکردن).
**ashy** (ash′i), *adj.* (١) خۆڵەمێشی؛ خۆڵەمێشاوی
(٢) ڕەنگ زەرد یا سپی هەڵگەڕاو.
**Asia** (ā′zhə, ā′shə), *n.* ئاسیا؛ کیشوەری ئاسیا.
**Asian** (ā′zhən, ā′shən), *adj. & n.* ئاسیاوی؛ خەڵکی ئاسیا.
**Asiatic** (ā′zhi-at′ik, ā′shi-at′ik), *adj. & n.* = Asian.
**aside** (ə-sīd′), *adv.* (١) ئەولاوە؛ لاوە؛ تەنیشتەوە:
*( He laid the book ~ .)*
(٢) ئەولاوە (بۆ لەبیربردنەوە): *( Put doubts ~ .)*.
(٣) خستنە ئەولاوە (بۆ هەڵگرتن بۆ کاتێکی تر):
*( Put this food ~ for me.)*
(٤) بەبێ؛ بێ؛ بەدەر: *( all joking ~ )*.
*n.* (١) وتەی لەلاوە وتراو؛ وتەی ئەکتەرێکە لەسەر شانۆ کە دەبێت تەنها تەماشاکەرەکان بیبیستن نەك ئەکتەرەکانی تر. (٢) لادان لە باس.
aside from, جگە لە؛ بێجگە لە؛ بەبێ.
joking aside, بێ گاڵتە.
**asinine** (as′ə-nīn′), *adj.* کەر؛ کەرانە؛ بێ مێشك؛ بێ مانا:
*( an ~ remark, act, etc.)*

**-asininely** *(adv.)*; asininity *(n.)*.
**ask** (ask, äsk), *v.t.* . (١) پرسین؛ پرسیارکردن: *( I ~ed a question.)*
(٢) تکاکردن؛ داواکردن: *( I ~ed her to do it.)* .
(٣) داواکردن؛ ویستن:
*( They ~ed twenty dollars for these shoes.)*
(٤) پێویست بوون
(٥) بانگ کردن (نامەنگ، خواردەمەنی):
*( A~ him to come in. ; They ~ed me to dinner.)*
(٦) [Archaic]: بڵاوکردنەوە یا جاڕدان (نیازی ژنهێنان).
*v.i.* (١) داواکردن؛ تکاکردن: *( I ~ed for a favor.)* .
(٢) ( ~ about; ~ for )، هەواڵ پرسین؛ داوای بینین کردن:
*( She ~ed about you. ; A~ for the manager.)*
**ask after,** هەواڵ پرسین
**ask for it,** بەسەر خۆدا هێنان (ناخۆشی).
**ask for trouble,** حەزکردن لە سەرئێشە؛ بە شوێن گژیەندا گەڕان.
**askance** (ə-skans′), *adv.* (١) بە لایەکی چاو؛ بە تیلەی چاو.
(٢) بە نارەزایانەو گومانو سەیر پێ هاتنەوە: *( He looked at her ~ .)* .
**askew** (ə-skū′), *adv.* (١) بە خواری؛ بە چەوتی.
(٢) بە لاتیلەی چاوو بە سووکیو قێزەوە.
*adj.* خوار؛ لار؛ چەوت.
**aslant** (ə-slant′), *adv.* بە خواری؛ بە چەوتی.
*adj.* خوار؛ چەوت.
*prep.* بەسەر شتێکدا یا لەم بەرەوە بۆ ئەوبەر بە خواری.
**asleep** (ə-slēp′), *adj.* (١) نووستوو؛ خەوتوو.
(٢) خەوالوو؛ سست" دواکەوتوو.
(٣) سڕ؛ مێروولەکردوو: *( Her arm is ~ .)*
(٤) مردوو.
*adv.* بە نووستوویی؛ بە خەوتوویی.
**aslope** (ə-slōp′), *adv.* بە لێژی؛ بە خواری.
*adj.* لێژ؛ خوار
**asocial** (ā-sō′shəl), *adj.* گۆشەگیر؛ حەزنەکەر بە تێکەڵاوبوونی خەڵك.
**asp** (asp), *n.* جۆرە مارێکی ژەهراوی بچووکە.
**asparagus** (ə-spar′ə-gəs), *n.* (١) سەوزەیەکە ئەوەندەی نێرکە- پیازێکە بە کوڵاوی دەخورێت. (٢) رووەکی ئەم سەوزەیە.
**aspartic acid,** ترشی ئەسپێرتیك
**aspect** (as′pekt), *n.* (١) رووخسار؛ سەرووسیما. (٢) شێوە.
(٣) روو (خانوو، شوێن)؛ دیو؛ لا: *( the eastern ~ of the house)* .
(٤) بار؛ روو (باس)؛ سەر (باس، نەخشە):
*( one ~ of the prom; They considered the plan in all its ~s.)*
(٥) شوێنو شێوەو دووروونزیکی ئەستێرەکان لەیەکترییەوە.
(٦) کاتی کردار (ڕێزمان). (٧) [Rare]، تەماشایەك.
**aspen** (as′pən), *n.* سپیدار
*adj.* (١) وەك سپیدار. (٢) شەکاوە؛ لەراوە.
**asper** (as′pēr), *n.* پارەیەکی تورکیو میسری کۆنە سەدوبیستویەکی قرشێکە.
**Asperges** (ə-spūr′jēz), *n.* (١) لێ هەڵپرژاندنی ئاوی پیرۆز لە قەشەو قوربانیکاو نوێژکەران بەر لە نوێژی یەك شەممە (ئاینی کاسۆلیکی).
(٢) سروودێکی ئاینییە لەکاتی ئەم ئاو لێ هەڵپرژاندنەدا دەووترێت.
**aspergillum** (as′pēr-jil′əm), *n.* فلچە یا دەفری ئاو هەڵپرژاندن (ووشەی پێشوو ببینە).
**asperity** (as-per′ə-ti), *n.* (١) زبری؛ ناسازی (دەنگ، ئاووهەوا).
(٢) تووڕەوترویی؛ سەرگەرمی.
**asperse** (ə-spūrs′), *v.t.* (١) ئاو لێ هەڵپرژاندن (پیرۆزکردنی منداڵ لە خاچ بەرستیدا) (٢) بەدگۆیی کردن؛ لەکەدارکردن؛ بوختان کردن.
**aspersion** (ə-spūr′zhən, ə-spūr′shən), *n.* (١) ئاو لێ هەڵپرژان

(٢) بەدگۆیی؛ لەکە؛ خراپە ووتن؛ بوختان؛ قسەی سووك:
*( to cast ~s on a person's character)*
(٣) بەدگۆیی کردن؛ بوختان بۆ کردن.
**asphalt** (as′fôlt, as′falt), *n.* قیر؛ زفت.
*v.t.* قیرتاوکردن.
**asphaltum** (as-fal′təm), *n.* = asphalt.
**asphodel** (as′fə-del′), *n.* ڕووەکێکە لە توخمی شلێر یا زەمەق گوڵی زەردو سپی دەگرێت.
**asphyxia** (as-fik′si-ə), *n.* تاسان؛ خنکان (لەبەر کەمیی ئۆکسجین).
**asphyxiant** (as-fik′si-ənt), *adj.* خنکێنەر.
*n.* ماددەی خنکێنەر.
**asphyxiate** (as-fik′si-āt′), *v.t.* خنکاندن (بە لێ بڕینی ئۆکسجین)؛ تاساندن.
*v.i.* خنکان؛ تاسان.
**-asphyxiation** *(n.)*.
**aspic** (as′pik), *n.* (١) [Poetic] ، جۆرە مارێکی ژەهراوییە.
(٢) شلەی گۆشتو ئاوی تەماتە.
**aspic** (as′pik), *n.* رووەکێکی بۆندارە.
**aspidistra** (as′pi-dis′trə), *n.* ڕووەکێکی زەمەقی گەڵاپانی هەمیشە سەوزە.
**aspirant** (ə-spīr′ənt, as′pə-rənt), *adj.* پلەبەرزی خواز؛ ئاواتەخوازی ئاوگەورەیی.
*n.* کەسێکی پلەبەرزخواز.
**aspirate** (as′pə-rāt′), *v.t.* (١) دەستپێکردنی بڕگەیەك بە دەنگێکی وەك: " h " : ( house, home ). (٢) پاڵ بە هەواوە نان لە دەمەوە لەکاتی بڕگانی تیپی وەك: ( p, t, k ) (دەنگناسی).
(٣) هەڵمژینی هەوا یا شلە لە لەش (پزیشکەوانی).
*n.* (١) دەنگی وەك تیپی " h " .
(٢) هەوا دەرچوون لە دەمەوە لەکاتی بڕگانی تیپی وەك: ( p, t, k ) دا.
**aspiration** (as′pə-rā′shən), *n.* (١) هەناسەدان؛ هەناسە.
(٢) بەرزی خواستن؛ پلەبەرزی خوازی؛ خواستی بەرز.
(٣) هەڵمژینی شلەو گاز لە لەش (پزیشکەوانی).
(٤) (ا) بڕگانی دەنگی تیپی " h " . (ب) دەنگێکی وەها.
**aspirator** (as′pə-rā′tēr), *n.* ئامێری هەڵمژینی شلەو گاز لە لەش یا شتی تر.
**-aspiratory** *(adj.)*.
**aspire** (ə-spīr′), *v.i.* (١) بەرزی خواستن؛ ویستن؛ هیوابوون؛ ئاوات بوون: *( He ~d to lead his countrymen.)* .
(٢) [Archaic]، بەرزبوونەوە؛ فڕین.
**aspirin** (as′pēr-in, as′prin), *n.* ئەسپرین: حەبی سەرئێشە.
**asquint** (ə-skwint′), *adv. & adj.* بە لاتیلەی چاو؛ بە لایەکی چاو.
**ass** (as), *n.* (١) کەر؛ گوێ درێژ. (٢) کەسێکی کەر یا بێ مێشك.
**make an ass of,** بە کەر دانان؛ گاڵتەپێکردن.
**make an ass of oneself,** وەك کەر جووڵانەوە؛ حەیای خۆ بردن؛ خۆ کردن بە گاڵتەچی خەڵك.
**ass** (as), *n.* [Slang], *Also* arse, قنگ (لەرووی سووکییەوە).
**assafetida, assafoetida** (as′ə-fet′i-də), *n.* = asafetida.
**assagai, assegai** (as′ə-gī′), *n.* (١) ڕمێکی دارینی نووك ئاسنە (هەندێك لە خێڵەکانی ئەفەریقا بەکاری دەهێنن).
(٢) درەختێکی دارجەرە ئەم جۆرە رمەی لێ دروست دەکرێت.
*v.t.* رم پێداکردن.
**assail** (ə-sāl′), *v.t.* (١) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان؛ لێدان.
(٢) هێرش بردنە سەر بە دەم؛ بەتوندی رەخنەلێگرتن.
(٣) بەرەنگاربوونی کێشە یا ئەرکێك بە هیممەتو بێ دوودڵی.
**assailant** (ə-sāl′ənt), *n.* هێرشبەر؛ هێرشکەر.

*( His ~s were arrested.)*
**assassin** (ə-sas′in), *n.* پیاوکوژ؛ ڕەشکوژ (هی کەسێکی بەناوبانگ).
**assassinate** (ə-sas′ə-nāt′), *v.t.* (١) کوشتن بە نهێنی (بەتایبەتی کەسێکی ناودار: *( They ~d many political activists.)* .
(٢) لەکەدارکردن؛ ناو پیس کردن.
**assassination** (ə-sas′ə-nā′shən), *n.* ڕەشکوژی؛ پیاو کوشتن (هی کەسێکی بەناوبانگ).
**assault** (ə-sôlt′), *n.* (١) هێرش؛ هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان؛ لێدان.
(٢) بە زۆر سواربوونی ئافرەت. (٣) هەڕەشە.
(٤) هێرشێکی کوتوپڕی سەربازی: *( an ~ on enemy positions)* .
*v.t. & v.i.* هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
**assault and battery,** هێرش بردنە سەرو بریندارکردن؛ لێدان؛ لێدانو ئازاردان.
**assay** (ə-sā′, as′ā), *n.* (١) تاقیکردنەوە.
(٢) شیکردنەوە یا لێکۆڵینەوە (کانزای خاو).
(٣) ماددەیەکی شیکراوە یا لێکۆڵراوە. (٤) ئەنجامی ئەم شیکردنەوەیە.
(٥) [Obs.]. هەوڵ؛ هەوڵدانێك.
*v.t.* (١) شیکردنەوە؛ لێکۆڵینەوە. (٢) [Archaic] ، هەوڵدان.
*v.i.* پیشاندان لە ئەنجامی شیکردنەوەدا.
**assegai** (as′ə-gī′), *n. & v.t.* = **assagai.**
**assemblage** (ə-sem′blij), *n.* (١) کۆبوونەوە؛ کۆکردنەوە؛ کۆڕ.
(٢) کۆمەڵە خەڵك. (٣) کۆمەڵە شت.
(٤) پێکەوەنان (پارچەکانی مەکینە)؛ خڕکردنەوە.
(٥) کۆ
**assemble** (ə-sem′b'l), *v.t.* (١) کۆکردنەوە؛ کۆڕپێکگرتن.
(٢) پێکەوەنان (پارچەکانی مەکینە)؛ خڕکردنەوە:
*( to ~ a watch, motor car, engine, etc.)*
*v.i.* کۆبوونەوە؛ کۆڕگرتن: *( The students ~d in the school hall.)* .
**assembly** (ə-sem′bli), *n.* (١) کۆبوونەوە؛ گردکردنەوە.
(٢) کۆڕ؛ کۆبوونەوە. (٣) [A-]، لقێکی پەرلەمان لە هەندێك لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا؛ ئەنجومەنی پەرلەمان. (٤) پێکەوەنان (پارچەکانی مەکینە)؛ خڕکردنەوە (٥) پارچەی وەها پێکەوەنراو.
(٦) کارگەی پێکەوەنانی پارچە (ئوتومبیل، مەکینە... هتد).
(٧) نیشانەی سەرباز بانگ کردن بۆ ڕیزبوون یا کۆبوونەوە (بە کەڕەنا یا تەپڵ).
**assembly line,** ڕیزی پێکەوەنانی پارچەکانی مەکینە (کە هەر کرێکارێك پارچەکەی خۆی دەنێت بە مەکینەکەوە لەکاتێکدا کە بە هێواشی بە بەردەمیدا دەڕوات لەسەر قایشێك)؛ ڕیزی کرێکارانی کارگە لەکاتی کارکردندا.
**assemblyman** (ə-sem′bli-mən), *n.* (١) نوێنەری پەرلەمان؛ ئەندامی پەرلەمان. (٢) [A-]، ئەندامی لقی خوارووی پەرلەمانی هەندێك لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا.
**assembly plant,** کارگەی پێکەوەنانی پارچەکانی مەکینە (ئوتومبیل، فڕۆکە).
**assent** (ə-sent′), *v.i.* قایل بوون؛ ڕێکەوتن؛ پەسەندکردن.
*n.* قایل بوون؛ ڕێکەوتن.
**-assenter; assentor** *(n.).*
**assentation** (as′en-tā′shən), *n.* قایل بوونی کوتوپڕیو دووڕوویی یا ڕووالەتی.
**assert** (ə-sûrt′), *v.t.* (١) ووتن بەبێ گومان؛ ووتن بە دڵنیاییەوە:
*( His friends ~ed that he was innocent.)*
(٢) لەسەر سووربوون (ماف، داوا): *( to ~ one's rights)* .
**assert oneself,** سووربوون لەسەر مافی خۆو ڕێز لێ گیران.
**-asserter; assertor** *(n.).*
**assertion** (ə-sûr′shən), *n.* (١) سووربوون لەسەر ماف، داوا، یا ڕێز لێ گیران. (٢) ووتە یا ووتراوێکی بێ پێچوپەنا؛ بڵاوکراوەی توندوتیژ.
**assertive** (ə-sûr′tiv), *adj.* (١) بەزەبر؛ ڕای خۆ بەسەردا سەپێن؛ سوور لەسەر: *( an ~ person)* .
(٢) بە زەبرەوە؛ پشت ئەستوور: *( an ~ manner)* .
**-assertively** *(adv.)*; **assertiveness** *(n.).*
**assess** (ə-ses′), *v.t.* (١) خەملاندن بۆ باج لەسەر دانان (زەویوزار، خانوو)؛ نرخ لەسەر دانان. (٢) قەبلاندن (سزا بە پارە).
(٣) باج یا سزای پارە لەسەر دانان.
(٤) هەڵسەنگاندن: *( to ~ a situation)* .
**assessment** (ə-ses′mənt), *n.* (١) خەملاندن بۆ باج لەسەر دانان (خانوو، زەویوزار)؛ نرخ لەسەر دانان. (٢) شێوەی خەملاندن یا قەبلاندن.
(٣) سەرجەمی باجی لەسەر دانراو (خانوو، زەویوزار)؛ سزای پارە.
**assessor** (ə-ses′ẽr), *n.* (١) خەملێنەری خانوو یا دەسکەوت بۆ باج لەسەر دانان؛ خەملێنەر. (٢) یاریدەدەری دادپرس.
(٣) ڕاوێژکاری کۆمیتەیەك.
**asset** (as′et), *n.* (١) سەرمایە؛ شتێکی بەنرخ کە هی کەسێك بێت.
(٢) تایبەخۆ یا شتێکی بەنرخ (ڕەووشت، ئازایی، جوانی، هێمنی... هتد):
*( Good health is a great ~ .)*
(٣) (*pl.*)، هەموو سەرمایەی کەسێك یا دەزگایەك.
(٤) (*pl.*)، هەموو سەرمایەی کەسێك یا دەزگایەك کە دەتوانرێت قەرزی پێ بدرێتەوە.
**asseverate** (ə-sev′ə-rāt′), *v.t.* ووتن بە دڵنیاییەوە؛ ووتن بەبێ گومان.
**-asseveration** *(n.).*
**assiduity** (as′ə-dū′ə-ti), *n.* (١) هەوڵو تەقەلای بەردەوام؛ کۆشش.
(٢) (*pl.*)، زۆر بەتەنگەوەهاتن؛ بۆ بە پەرۆشەوە بوون؛ دڵسۆزی.
**assiduous** (ə-sij′ōō-əs), *adj.* (١) کۆششکەر؛ وورد؛ کۆڵنەدەر.
(٢) دڵسۆز؛ بەتەنگەوەهاتوو.
**assign** (ə-sīn′), *v.t.* (١) دیاری کردن؛ دانان؛ تەرخان کردن:
*( They ~ed him his own room.)*
(٢) پێ سپاردن؛ دانان: *( I was ~ed to watch the road.)* .
(٣) بەسەرداdan (ئەرك، فرمان، خوێندنەوە)؛ پێدان (ئەرك):
*( The teacher ~ed the students a lot of homework.)*
(٤) دیاری کردن؛ دانان بە هۆ؛ دانەپاڵ:
*( Jealousy was ~ed as the motive for the crime.)*
(٥) مافی خاوەنێتی دان بە کەسێکی تر.
*v.i.* مافی خاوەنێتی دان بە کەسێکی تر.
**assignat** (as′ig-nat′), *n.* پارەیەکی کاغەزە لەکاتی شۆڕشی فەرەنسادا دەردەکرا (پشتیوانی دارایی زەویوزاری دەست بەسەردا گیراو بوو).
**assignation** (as′ig-nā′shən), *n.* (١) دانان؛ تەرخان کردن؛ دیاری کردن. (٢) شتێکی دانراو، دیاریکراو، یا تەرخان کراو.
(٣) ژوان (بەتایبەتی هی دڵداری نهێنی).
(٤) مافی خاوەنێتی دان بە کەسێکی تر.
**assignee** (ə-sī′nē′, as′ə-nē′), *n.* (١) کەسێك کە مافی خاوەنێتی زەویوزار یا شتی تری پێ دەدرێت. (٢) جێگر؛ نوێنەر؛ بریکار.
**assigner, assignor** (ə-sīn′ẽr), *n.* بکەری **assign** .
**assignment** (ə-sīn′mənt), *n.* (١) دانان؛ دیاری کردن؛ تەرخان کردن.
(٢) ئەرکی سەرشان؛ ئەرکی پێدراو (قوتابی):
*( The chemistry ~ was difficult.)*
(٣) (ا) مافی خاوەنێتی پێدان.
(ب) تاپۆ؛ مافنامە.
**assimilable** (ə-sim′'l-ə-b'l), *adj.* (١) دەتوێنرێتەوە (خواردەمەنی لە لەشدا)؛ هەرس دەکرێت. (٢) دەتوێنرێتەوە (ڕەگەز).
(٣) دەچێتە مێشکەوە.
**assimilate** (ə-sim′'l-āt′), *v.t.* (١) گۆڕینی خواردەمەنی بۆ شانەی زیندوو پاش هەڵمژینی لە ڕیخۆڵەدا: *( The body ~s food.)* .
(٢) تواندنەوە (ڕەگەز)؛ قووتدان؛ کردن بە بەشێك لە خۆ:

*( to ~ a racial group in the society.)*
(٣) بەراووردکردن. (٤) چوونیەك لێکردن.
(٥) باش تێگەیشتن؛ چوونە مێشکەوە: *( to ~ knowledge)* .
*v.i.* (١) وەك یەك لێهاتن.
(٢) توانەوە (رەگەز)؛ قووتدران:
*( Minority groups often ~ by intermarriage.)*
**assimilation** (ə-sim´'l-ā'shən), *n.* (١) گۆڕینی خواردەمەنی بۆ شانەی زیندوو دوای هەڵمژینی لە ڕیخۆڵەدا.
(٢) تواندنەوە (رەگەز)؛ توانەوە.
(٣) قووتدانی دەنگێك یا وون بوونی لە دەنگەکەی دوایەوە (دەنگناسی).
(وەك تیپی " p " لە وشەی " cupboard " دا وون دەبێت).
**assimilative** (ə-sim'’l-ā´tiv), *adj.* تایبەتی بە تواندنەوەو مژینی خواردەمەنی؛ توێنەرەوە.
**assimilatory** (ə-sim'’l-ə-tôr´i, ə-sim'’l-ə-tō´ri), *adj.* **assimilative.**
**assist** (ə-sist'), *v.t. & v.i.* یارمەتیدان؛ یاریدەدان؛ دەستگیرۆیی کردن.
*n.* یارمەتی؛ یاریدە؛ دەستگیرۆیی.
**assist at,** تێدا ئامادەبوون (کۆڕ، ڕووداو)؛ تێدا بەشداربوون.
**assistance** (ə-sis'təns), *n.* یارمەتی؛ یاریدە؛ دەستگیرۆیی:
*( Can I be of any ~ ?)*
**assistant** (ə-sis'tənt), *n. & adj.* یاریدەدەر؛ یارمەتیدەر.
**assistant professor,** مامۆستای یاریدەدەر (زانکۆ).
**assize** (ə-sīz'), *n.* (١) ئەنجوومەن؛ کۆڕ. (٢) بڕیارەکانی ئەم ئەنجوومەنە.
(٣) (*pl.*). کۆڕی دادگای گەڕۆك لە ئینگلتەرەدا.
(٤) (*pl.*). شوێن و کاتی کۆڕی ئەم دادگایانە.
(٥) لێکۆڵینەوەی دادگا لە ڕووداوێکی گرنگ وەك مردنێك؛ فەرمانی دەست-پێکردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە؛ بڕیار یا ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە.
(٦) یاسای بڕینەوەی ئەندازەو پێوانەو نرخی فرۆتەنی.
(٧) ئەم ئەندازەو پێوانانە.
**associate** (ə-sō'shi-āt´), *v.t.* (١) پێکەوەبەستن؛ لێکدان.
(٢) لەگەڵدا هەڵسان و دانیشتن؛ هاوڕێیەتی لەگەڵ کردن.
(٣) پێکەوەبەستن لە مێشکدا یا لە هەستدا؛ لە هەمان گۆشەوە بینین:
*( She ~s rain with grief.)*
*v.i.* (١) بوون بە هاوڕێ؛ هاوڕێیەتی کردن؛ لەگەڵدا بوون:
*( to ~ with somebody)*
(٢) چوونەناو (ڕێکخراو).
*n.* (١) برادەر؛ هاوڕێ؛ هاوبەش؛ هاوکار.
(٢) ئەندامی یاریدەدەر (ڕێکخراو، دەزگا). (٣) شتێکی پێوەبەستراو.
(٤) بڕوانامەیەکە (دانشگا).
*adj.* (١) هاومەبەست؛ هاونیاز؛ هاوکار.
(٢) یاریدەدەر (ئەندام): *( an ~ justice, member, etc.)* .
(٣) پاشکۆ.
**-associable** *(adj.).*
**associate professor,** مامۆستای یاریدەدەر (زانکۆ).
**association** (ə-sō´si-ā'shən, ə-sō´shi-ā'shən), *n.* (١) لەیەك-دران؛ پێکەوەبەستن؛ پێکەوەبوون. (٢) برادەرێتی؛ هاوڕێیەتی.
(٣) ڕێکخراو؛ کۆمەڵە؛ یانە؛ یەکێتی: *( a student ~ )* .
(٤) پەیوەندی نێوان بیروباوەڕ، هەست یا ڕووداو لە مێشکدا:
*( the ~ of snow with romance)*
(٥) یاری فوتبۆڵێن یا شەق شەقێن.
**association football,** یاری فوتبۆڵێن یا شەق شەقێن.
**associative** (ə-sō'shi-ā´tiv, ə-sō'shi-ə-tiv), *adj.* بیرخەرەوە؛ پەیوەندی پەیداکەر لەنێواندا؛ پێکەوەبەستێنەر لە مێشکدا.
**assoil** (ə-soil'), *v.t.* (١) بەخشین؛ لێبووردن؛ ئازادکردن.
(٢) گوناە سڕینەوە لەڕێی سزا چەشتنەوە؛ ئازادبوون لەڕێی سزا چەشتنەوە؛
بۆ بژاردن لەڕێی سزاوە.
**assonance** (as'ə-nəns), *n.* (١) چوونیەکی دەنگ؛ هاودەنگی.
(٢) چوونیەکی؛ لەیەکچوون.
(٣) نیمچە هاوکێشەیی دوا وشەی هەڵبەست.
**assonant** (as'ə-nənt), *adj.* هاودەنگ.
*n.* وشەی هاودەنگ.
**assort** (ə-sôrt'), *v.t.* (١) هاوپۆل کردن؛ جیاکردنەوە؛ پۆلێن کردن؛ ڕێکخستن. (٢) فرۆتەنی یا شتوومەکی هەمەچەشنە خستنە عەمارەوە.
*v.i.* (١) ( with ~ )، لێچوون؛ لێکردن؛ گونجان؛ لێهاتن؛ شیان.
(٢) ( with ~ )، هاوڕێیەتی کردن؛ لەگەڵدا هەڵسان و دانیشتن.
**assorted** (ə-sôr'tid), *adj.* (١) هەمەچەشنە؛ جۆراوجۆر؛ تێکەڵاو.
(٢) هاوپۆل؛ پۆل پۆل کراو.
(٣) یەکخراو (مرۆڤ، شت)؛ هاونیلەکراو: *( a poorly ~ pair)* .
**assortment** (ə-sôrt'mənt), *n.* (١) هاوپۆل کردن؛ ڕێکخستن.
(٢) کۆمەڵێکی هەمەچەشنە؛ کۆمەڵێکی جۆراوجۆر:
*( an ~ of fruits and vegetables)*
**asst.,** = **assistant.**
**assuage** (ɔ-swāj'), *v.t.* (١) کەمکردنەوە (ئێش و ئازار، مەترسی، ناخۆشی). (٢) هێمن کردنەوە؛ دڵنەوایی کردن.
(٣) شکاندن (تینوێتی)؛ دامرکاندنەوە؛ تێرکردن.
**-assuagement** *(n.).*
**assuasive** (ə-swā'siv), *adj.* هێمنکەرەوە؛ دڵخۆشکەر؛ خۆش.
**assumable** (ə-sōōm'ə-b'l, ə-sūm'ə-b'l), *adj.* (١) دەگیرێتە ئەستۆی خۆ: *( an ~ loan)* . (٢) وادادەنرێت.
**assume** (ə-sōōm', ə-sūm'), *v.t.* (١) لەبەرکردن (جل و بەرگ).
(٢) گرتنە ئەستۆ: *( He ~d the responsibility.)* .
(٣) گرتنەدەست: *( He ~d the presidency in 1960.)* .
(٤) خۆگۆڕین؛ وەرگرتن:
*( It ~s many shapes.; He ~d a new name.)*
(٥) وادەرخستن؛ وانوواندن: *( He ~d a look of innocence.)* .
(٦) وەرگرتن بە ئەندام یا هاوبەش.
(٧) وادانان؛ دانان؛ گریمان: *( Let us ~ that this is true.; We ~d that he would come on time.)*
*v.i.* خۆدەرخستن؛ خۆنوواندن؛ لەخۆوە وادانان.
**assumed** (ə-sōōmd', ə-sūmd'), *adj.* (١) نهێنی (ناو)؛ درۆزنە؛ درۆ: *( He wrote under an ~ name.)* .
(٢) وادانراو؛ گریمانەکی.
**assuming** (ə-sōōm'iŋ, ə-sūm'iŋ), *adj.* بەفیز؛ خۆدەرخەر.
**assumption** (ə-sump'shən), *n.* (١) بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان (ئاین).
(٢) [A-]، چوونی مەریەم بۆ ئاسمان.
(٣) گریمانەکی؛ وادانان؛ دانان: *( Their ~ that the war would end in six months proved wrong.)*
(٤) جڵەو گرتنەدەست خۆ: *( his ~ of power)* .
(٥) لەخۆوە وادانان.
**assurance** (ə-shoor'əns), *n.* (١) دڵنیایی؛ مسۆگەری:
*( We have no ~ that he will come.)*
(٢) بەڵێن: *( I have her ~ regarding this matter.)* .
(٣) بڕوا بە خۆ بوون؛ پشت بە خۆ بەستن.
(٤) بێ شەرمی؛ چاوقایمی. (٥) بیمەی ژیان.
**assure** (ə-shoor'), *v.t.* (١) دڵنیاکردن: *( The news ~d us.)* .
(٢) بەڵێن پێدان: *( I ~ you I'll be there.)* .
(٣) مسۆگەرکردن: *( Does hard work ~ success?)* .
(٤) بیمەکردن.
**assured** (ə-shoord'), *adj.* (١) مسۆگەر؛ بێ گومان؛ دڵنیا.
(٢) چاوقایم؛ پشت ئەستوور؛ بڕوا بە خۆ هەبوو.

(٢) بیمەدار؛ بیمەکراو.

**assuredly** (ə-shoor′id-li), *adv.* (١) بەبێ گومان؛ بە دڵنیایی‌یەوە.
(٢) بە پشت ئەستوورانە؛ بە بڕوای تەواوەوە.

**assurgent** (ə-sûr′jənt), *adj.* (١) بەرزبووەوە
(٢) بە چەوتی بۆ سەرەوە چوو (ڕووەك).

**Assyrian** (ə-sir′i-ən), *adj.* (١) ئاشووری (گەل، زمان، کلتوور).
(٢) تایبەتی بە خانووسازیی ئاشووری.
*n.* (١) ئاشووری‌یەك. (٢) زمانی ئاشووری.

**Assyriology** (ə-sir′i-ol′ə-ji), *n.* زانستی ئاشووری‌یەکان و کەلەپوورەکەیان.

**Astarte** (as-tär′ti), *n.* عیشتار: بانوخوای مانگ و پیت و دڵداری فینیقی‌یەکان

**astasia** (ā-sta′si-ə), *n.* توانای بە پێوە وەستان نەبوون بەهۆی شل و شێواوی ماسولکەکانەوە.

**astatic** (ā-stat′ik, ə-stat′ik), *adj.* (١) شلۆق؛ ناجێگیر؛ ناپتەو.
(٢) هەمیشە گۆڕاو (فیزیا).

**-astatically** *(adv.)*; **astaticism** *(n.)*.

**aster** (as′tēr), *n.* گوڵەئەستێرە.

**aster-** (as′tēr), پێشگرێکە بەمانای: ئەستێرە *(asteroid)*.

**-aster** (as′tēr), پاشگرێکە بەمانای: (١) بچکۆلەیی (بەرخۆلە، کچۆلە).
(٢) چوونیەکی. (٣) هیچ و پووچی؛ بێ نرخی؛ قەڵبی: *(poetaster)*.

**asterisk** (as′tēr-isk′), *n.* گوڵەئەستێرە نیشانەیەکی چاپەمەنی پەراوێزی‌یە وەك ئەمە ( * ).
*v.t.* دانانی ئەم نیشانەیە ( * ) لە پەراوێزدا.

**asterism** (as′tēr-iz′m), *n.* (١) کۆئەستێرە؛ کۆ.
(٢) نیشانەیەکی ئەستێرەیی‌یە لە هەندێك بلووردا لەبەر ڕووناکیدا دەردەکەوێت.
(٣) سێ ئەستێرەنیشانی بە سێگۆشەیی دانراو بۆ سەرنج ڕاکێشان لە چاپەمەنیدا.

**astern** (ə-stûrn′), *adj. & adv.* (١) لە پاشەڵی کەشتی یا بەلەمێکەوە.
(٢) لە دواوە؛ لە بەشی دواوە.
(٣) بەرەو دوا؛ بۆ دواوە (کەشتی): *( full speed ~ )*.
(٤) دواکەوتوو: *( fall ~ )*.

**asternal** (ā-stûr′n′l), *adj.* (١) نەبەستراوە بە ئێسکەکۆڵەوە.
(٢) ئێسکەکۆڵە نی‌یە؛ بەبێ کۆڵەی سنگ.

**asteroid** (as′tēr-oid′), *adj.* ئەستێرەیی.
*n.* (١) ئەستێرەیەکی گەڕۆکی بچووك.
(٢) ئەستێرەماسی.

**asthenia** (as-thē′ni-ə, as′thə-nī′ə), *n.* لاوازی؛ بێ وزەیی؛ بێ هێزی لەش.

**asthenic** (as-then′ik), *adj.* لاواز؛ بێ وزە؛ بێ هێز.
*n.* کەسێکی باریکەلە؛ کەسێکی لاواز.

**asthenopia** (as′thə-nō′pi-ə), *n.* نەخۆشی‌یەکی چاوە سەرئێشە و گێژیی لەگەڵدایە.

**asthma** (az′mə, as′mə), *n.* هەناسەتەنگی؛ تەنگەنەفەسی.

**asthmatic** (az-mat′ik, as-mat′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە تەنگە- هەناسەیی یا ئازما. (٢) تەنگەهەناسەیی لەگەڵە؛ ئازمای هەیە.
*n.* کەسێکی هەناسەتەنگ.

**astigmatic** (as′tig-mat′ik), *adj.* (١) ئەستیگماتیزمی هەیە؛ پرش بین. (٢) نەخۆشی پرش بینی چاك دەکاتەوە (وشەی داهاتوو ببینە).

**astigmatism** (ə-stig′mə-tiz′m), *n.* ئەستیگماتیزم؛ پرش بینی: نەخۆشی‌یەکی چاوە.

**astir** (ə-stûr′), *adv. & adj.* (١) بزووا؛ لە جموجوولدایە؛ ووروژاو: *( The whole town is ~ today.)*
(٢) لە خەو هەڵساو؛ بەخەبەر.

**astomatous** (ā-stom′ə-təs, ā-stō′mə-təs), *adj.* بێ دەم- (زیندەوەرناسی)؛ دەمی نی‌یە.

**astonish** (ə-ston′ish), *v.t.* سەرسووڕماندن؛ سەرسام کردن؛ واق ووڕماندن.

**astonished** (ə-ston′isht), *adj.* سەرسووڕماو؛ سەرسام؛ واق ووڕماو.

**astonishing** (ə-ston′ish-iŋ), *adj.* سەرسووڕمێنەر؛ سەرسامکەر؛ واق ووڕمێنەر؛ زۆر سەیر: *( an ~ person, event, sight, act, etc.)*.

**astonishment** (ə-ston′ish-mənt), *n.* سەرسووڕمان؛ سەرسامی؛ واق ووڕمان؛ واق ووڕماوی.

**astound** (ə-stound′), *v.t.* زۆر سەرسووڕماندن؛ زۆر سەرسام کردن؛ واق ووڕماندن: *( He ~ed everyone by his resignation.)*

**astounding** (ə-stound′iŋ), *adj.* سەرسووڕمێنەر؛ واق ووڕمێنەر.

**astrachan** (as′trə-kən), *n.* (١) کەوڵ یا فەروەی بەرخی " ئەستراخان " ی سۆڤێتی. (٢) [A-]، جۆرە سێوێکە (لە سەرەتاوە لە یەکێتی سۆڤێتی جارانەوە هاتووە).

**astraddle** (ə-strad′′l), *adv. & adj.* هەر قاچەی لە دیوێك (وەك: سواربوونی وولاخ)؛ گەڵ بڵاو؛ بە گەڵ بڵاوی.

**Astraea** (as-trē′ə), *n.* بانووخوای دادپەرستی (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان).

**astragal** (as′trə-g′l), *n.* (١) خرتکە؛ ئێسقانی قولەپێ.
(٢) شتێکی ڕازێنەرەوەیە وەك مووروو (خانووسازی).

**astragalus** (as-trag′ə-ləs), *n.* = astragal.

**astrakhan** (as′trə-kən), *n.* (١) کەوڵ یا فەروەی بەرخی " ئەستراخان " (کە خووری‌یەکی لوولە).
(٢) قوماشی خوری بەرخی " ئەستراخان " .

**astral** (as′trəl), *adj.* (١) ئەستێرەیی؛ تایبەتی بە ئەستێرەکان.
(٢) گوڵەئەستێرەیی (ڕووەکناسی)؛ لە ئەستێرە دەچێت.
(٣) ئاسمانی؛ بەرز؛ بە دەست نەگیراو.

**astray** (ə-strā′), *adv. & adj.* لە ڕێی ڕاست لادەر؛ گومڕا؛ تەرە؛ وون؛ بەهەڵەداچوو.
  go astray, بەهەڵەداچوون؛ ڕێی خراپ گرتن؛ وون بوون؛ تەرەبوون.
  lead astray, بەهەڵەدابردن؛ خستنەسەر ڕێی چەوت یا خراپ.

**astrict** (ə-strikt′), *v.t.* بەستنەوە؛ ڕێ لێگرتن؛ جڵەوگرتن.

**-astriction** *(n.)*.

**astride** (ə-strīd′), *adv., adj., & prep.* (١) هەر قاچەی لە دیوێك (وەك: سواربوونی وولاخ): *( to ride ~ )*. (٢) گەڵ بڵاو؛ بە گەڵ بڵاوی.

**astringe** (ə-strinj′), *v.t.* [Rare], کرژکردن؛ هێنانەوەیەك.

**astringent** (ə-strin′jənt), *adj.* (١) بۆری و دەزوولەی خوێن کرژکەر و ڕێگر لە خوێن. (٢) کرژکەر؛ هێنەرەوەیەك؛ تورتکەرەوە.
(٣) توندوتیژ؛ بەزەبر؛ دڵڕەق؛ بێ بەزەیی.
*n.* دەرمان یا ماددەی کرژکەری دەزوولەی خوێن.

**astro-** (as′trō, as′trə), پێشگرێکە بەمانای: (١) ئەستێرەیی؛ تایبەتی بە ئەستێرەکان: *(astrophysics)*.
(٢) ئەستێرەیی (ڕووەکناسی)؛ گوڵەئەستێرەیی.

**astrodome** (as′trə-dōm′), *n.*: (١) ڕوانگەی گوومەزەیی ئەستێرەکان: خانەیەکی گوومەزەیی ڕۆشنە لەسەر فڕۆکەیەك ئامێری ئاسمانزانی تێدا دادەنرێت. (٢) یاریگایەکی سەرگیراوی گوومەزەیی‌یە.

**astrolabe** (as′trə-lāb′), *n.* ئەسترلاب: پێوەری بەرزیی ئەستێرە.

**astrologer** (ə-strol′ə-jēr), *n.* ئەستێرەوان؛ ئەستێرەگەر.

**astrological** (as′trə-loj′i-k′l), *adj.* تایبەتی بە ئەستێرەگەری؛ تایبەتی بە ئەستێرەوانی.

**astrology** (ə-strol′ə-ji), *n.* ئەستێرەوانی؛ ئەستێرەگەری؛ لێکۆڵینەوەی شوێنی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان و پەیوەندی‌یان بە ژیانی مرۆڤەوە.

**astronaut** (as′trə-nôt′), *n.* ئاسمانگەڕ؛ فڕۆکەوانی کەشتی هەوایی؛

ئاسمانەوان.

**astronautics** (as´trə-nô′tiks), *n.pl.* زانستی ئاسمانگەڕی؛ زانستی هاتوچۆکردن بۆ مانگو ئەستێرە گەڕۆکەکانی تر.

**astronomer** (ə-stron′ə-mẽr), *n.* ئەستێرەناس؛ گەردوونناس.

**astronomical** (as´trə-nom′i-k'l), *adj.* (١) تایبەتی بە زانستی گەردوون؛ تایبەتی بە ئەستێرەناسی.
(٢) لە ژماردن نەهاتوو؛ بێ شومار؛ ئێجگار زۆر: *(~ figures)* .

-astronomically *(adv.).*

**astronomy** (ə-stron′ə-mi), *n.* زانستی گەردوون؛ گەردوونناسی؛ ئەستێرەناسی.

**astrophysics** (as´trō-fiz′iks), *n.pl.* فیزیای ئەستێرەناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوەی تایبەخۆر دیاردە فیزیاییەکانی ئەستێرەکان.

-astrophysical *(adj.)*; astrophysicist *(n.).*

**astucious** (as-tōō′shəs, as-tū′shəs), *adj.* = astute.

**astute** (ə-stōōt′, ə-stūt′), *adj.* دانا؛ زۆرزان؛ فێڵباز؛ زیرەك.

**astylar** (ā-stī′lẽr), *adj.* بێ کۆڵەکە.

**asunder** (ə-sun′dẽr), *adv.* (١) پارچەپارچەکراو؛ لەیەك جیاکراوە؛ پچڕێنراو: *( Her heart was torn ~ .)* .
(٢) دوور لەیەکەوە؛ جیاکراوە؛ جیابووەوە؛ جیا:
*( Parents and children were driven ~ by the war.)*
*adj.* دوور لەیەکەوە؛ جیا.

**asylum** (ə-sī′ləm), *n.* (١) پەناگا؛ داڵدە؛ لانە؛ پەنا؛ پەنابەری.
(٢) پەنابەریی ڕامیاری (کە ئەدرێت بە کەسێك کە ڕای کردبێت لە دەست میری وڵاتەکەی خۆی): *( political ~ )* .
(٣) شێتخانە: نەخۆشخانەی شێتەکان؛ هەژارخانە؛ کەفتەکارخانە.

**asymmetric** (ā´si-met′rik, as´i-met′rik), *adj.* = asymmetrical.

**asymmetrical** (ā´si-met′ri-k'l, as´i-met′ri-k'l), *adj.* خوار؛ لار؛ لاسەنگ؛ ناڕێك؛ خواروخێچ.

**asymmetry** (ā-sim′i-tri, as-im′i-tri), *n.* خواری؛ لاری؛ لاسەنگی؛ ناڕێکی؛ خواروخێچی.

**asymptote** (as′im-tōt´, as′imp-tōt´), *n.* هێڵی نزیك (بیرکاری).

-asymptotic; asymptotical *(adj.).*

**asynchronism** (ā-siŋ′krə-niz'm, as-iŋ′krə-niz'm), *n.* نا- هاوکاتی؛ پێکەوە ڕووننەدان.

**asynchronous** (ā-siŋ′krə-nəs, as-iŋ′krə-nəs), *adj.* پێکەوە ڕووننەداو؛ ناهاوکات.

**at** (at; *unstressed*, ət), *prep.* (١) لە؛ لەناو
*( ~ school; ~ heart)*
(٢) بەرەو: *( Look ~ him.)* .
(٣) پیادا؛ پێیدا؛ پیا: *( throw ~ )* .
(٤) لەسەر: *( We ate ~ the table.)* .
(٥) لەوێوە؛ لە: *( Come in ~ the front door.)* .
(٦) لە: *( Get the news ~ its source.)* .
(٧) لە (شوێن): *( He is ~ the party.)* .
(٨) خەریك؛ لە: *( He is ~ work.)* .
(٩) لە: *( They are ~ war.)* .
(١٠) بە؛ بە هۆی؛ پێی: *( She was pleased ~ the sight.)* .
(١١) بەپێی؛ بەگوێرەی؛ بە: *( ~ will)* .
(١٢) لەژێر: *( We are ~ their mercy.)* .
(١٣) (ا) بە: *( ~ five dollars each)* .
(ب) لە: *( ~ twenty miles per hour)* .
(١٤) لە (کات): *( ~ that time; ~ six o'clock; ~ sixty-five)* .
(١٥) بە: *( ~ a trot)* .

**at last,** لەدواییدا؛ لەئەنجامدا.

**at least,** هیچ نەبێت؛ بە لای کەمەوە.

**at once,** (١) یەکسەر؛ دەستبەجێ. (٢) لە هەمان کاتدا.

**at (the) most,** پەڕی ئەوپەڕی.

**ataman** (at′ə-man´), *n.* سەرۆکێکی کۆزاخی.

**ataraxia** (at´ə-rak′si-ə), *n.* هێمنی؛ لەسەرخۆیی.

**ataraxic** (at´ə-rak′sik), *n.* دەرمانی هێمنکەرەوە.

**ataraxy** (at′ə-rak´si), *n.* = ataraxia.

**atavic** (ə-tav′ik), *adj.* تایبەتی بە باپیرو داپیرە هەرە گەورە.

**atavism** (at′ə-viz'm), *n.* (١) لە باپیرو داپیرە هەرە گەورە چوون؛ دەرکەوتنی تایبەخۆی باووباپیری کۆن لە نەوەی ئێستادا کە لە پشتە نزیکەکاندا، واتە باوك‌و دایکدا نەبووە.
(٢) گەڕانەوە بۆ سەرچاوە؛ گەڕانەوە بۆ بابەتی کۆن.

-atavist *(n.)*; atavistic *(adj.).*

**ataxia** (ə-tak′si-ə), *n.* نەتوانینی یەکخستنی بزواندنی خۆویستی ماسولکە؛ کاربۆپێنەکرانی ماسولکەکانی لەش پێکەوە.

**ataxic** (ə-tak′sik), *adj.* تایبەتی بە کاربۆپێنەکرانی ماسولکەکانی لەش پێکەوە.
*n.* کەسێك کە توانای یەکخستنی کاری خۆویستی ماسولکەکانی نەبێت.

**ataxy** (ə-tak′si), *n.* = ataxia.

**ate** (āt), *past tense of* eat.

**-ate** (āt), پاشگرێکە بەمانای: (١) بوون (گەورەبوون)؛ بوون بە:
*(maturate, evaporate)*
(٢) والێکردن: *(invalidate, sublimate)* .
(٣) بوون بە هۆی: *(salivate)* .
(٤) لێدان (دەرمان)؛ کوتان؛ کردن: *(vaccinate, refrigerate)* .
(٥) بە جۆرێکی تایبەتی کردن: *(delineate)* .
(٦) تێکردن: *(oxygenate)* . (٧) – یی؛ وەهایی: *(collegiate)* .
(٨) پڕ لە؛ بە؛ – دار: *(passionate)* . (٩) کراو؛ والێکراو: *(animate)* .

**-ate** (āt, it), پاشگرێکە بەمانای: (١) کاربەدەست؛ کاربەدەستایەتی؛ پلەوپایە: *(directorate, potentate)* .
(٢) لێ دروستکراو (کیمیا): *(nitrate)* .

**atelier** (at´'l-yā′), *n.* ستودیۆی نیگارکێش؛ کارخانە.

**athanasia** (ath´ə-nā′zhi-ə, ath´ə-nā′zhə), *n.* نەمری؛ ژیانی هەتاهەتایی.

**atheism** (ā′thē-iz'm), *n.* خوانەناسی؛ بڕوانەبوون بە خوا؛ کافری.

**atheist** (ā′thē-ist), *n.* خوانەناس؛ خوانەپەرست؛ کافر؛ بێ بڕوا بە خوا.

**atheistic** (ā´thē-is′tik), *adj.* تایبەتی بە بێ بڕوایی بە خوا؛ تایبەتی بە خوانەناسی؛ کافری.

-atheistical *(adj.)*; atheistically *(adv.).*

**atheling** (ath′əl-iŋ), *n.* میر یا شازادەیەکی ئەنگلۆ-ساکسۆنی.

**Athena** (ə-thē′nə), *n.* ئەسینا: بانووخوای ژیری‌و هونەرو شەڕوشۆڕ (ئەفسانەی یۆنانی).

**athenaeum** (ath′ə-nē′əm), *n.* (١) [A-] ، پەرستگای " ئەسینا " لە پایتەختی یۆنان کە جێ کۆڕی نووسەرو زانایان بوو.
(٢) کۆڕێکی وێژەیی یا زانستی. (٣) کتێبخانە؛ ژووری خوێندنەوە.

**Athene** (ə-thē′nē), *n.* = Athena.

**Athenian** (ə-thē′ni-ən), *adj.* تایبەتی بە " ئەسینا " ی پایتەختی یۆنان‌و دانیشتووەکانی.
*n.* (١) دانیشتوویەکی " ئەسینا " ی پایتەختی یۆنان؛ ئەسینی.
(٢) هاووڵاتییەکی " ئەسینا " ی کۆن.

**Athens** (ath′inz), *n.* ئەسینا (پایتەختی یۆنان).

**athermancy** (ā-thûr′mən-si), *n.* تیشکی گەرما کارتێنەکردن.

**athermanous** (ā-thûr′mə-nəs), *adj.* تیشکی گەرما کارتێنەکەر.

**atherosclerosis** (ath´ẽr-ō-skli-rō′sis), *n.* ڕەق بوونی دەماری خوێن؛ تەسکبوونەوەو بەگیرەستانی دەماری خوێن (نەخۆشی زانی).

**athirst** (ə-thûrst′), *adj.* (١) [Archaic & Poetic]، تینوو. (٢) بە پەرۆش (بۆ شتێك).
**athlete** (ath′lēt), *n.* وەرزشكار؛ وەرزشەوان.
**athlete's foot,** ئالۆشی قاچ: نەخۆشییەكی پێستە میكرۆبەكەی لە شوێنی شێداردا دەژیو تووشی قاچی وەرزشكار دەبێتو دەبێت بە هۆی خووروویەكی زۆر بەتایبەتی لەنێوان پەنجەی پێدا.
**athletic** (ath-let′ik), *adj.* (١) وەرزشی. (٢) چالاك؛ بەهێز؛ بەهێزو ماسولكەدار وەك وەرزشكار: *( an ~ person)* .
-**athletically** *(adv.)*; **athleticism** *(n.)*.
**athletics** (ath-let′iks), *n.pl.* وەرزش.
**athwart** (ə-thwôrt′), *prep.* (١) لەم بەرەوە بۆ ئەوبەر؛ بەسەر. (٢) دژ؛ پێچەوانە.
*adv.* (١) بە شەقتوول؛ لەم بەرەوە بۆ ئەوبەر؛ بەسەر. (٢) بە پێچەوانە؛ دژ؛ ڕێ لێگر.
-**atic** (at′ik), پاشگرێكە بەمانای: تایبەتی بە؛ لەو بابەتە؛ هی: *(lymphatic, chromatic)*
**atilt** (ə-tilt′), *adj. & adv.* لار؛ خوار؛ بەلاداكەوتوو.
**atingle** (ə-tiŋ′g'l), *adj.* بەجۆش؛ بەجۆش‌وخرۆش.
-**ation** (ā′shən), پاشگرێكە بەمانای: (١) كردن؛ كردار: *(strangulation, negotiation, translation)* (٢) بار؛ دۆخ: *(isolation, moderation)* . (٣) ئەنجامی كار: *(civilization, dramatization)* .
-**ative** (ā′tiv, ə-tiv), پاشگرێكە بەمانای: پەیوەندیدار؛ وەك: *(illustrative, demonstrative, authoritative)*
**atlantes** (at-lan′tēz), *n.pl.* پەیكەری پیاو بەپێوە یا بە چەماوەیی كە لەبری كۆڵەكە بەكاردەهێنرێت (خانووسازی).
**Atlantic** (at-lan′tik), *adj.* تایبەتی بە ئۆقیانووسی ئەتڵەسی.
*n.* ئۆقیانووسی ئەتڵەسی.
**Atlantis** (at-lan′tis), *n.* دوورگەیەكی ئەفسانەیییە كە گوایە لە ئۆقیانووسی ئەتڵەسیدا بووەو نوقوم بووە.
**Atlas** (at′ləs), *n.* (١) لە ئەفسانەی یۆنانیدا: (ا) فیلەتەنێكە كە ناچاری ئاسمانی لەسەر شانی ڕاگرتووە. (ب) خودای كۆڵەكەكانی ئاسمان. (ج) پاشایەكە كە كراوە بە شاخ. (٢) كەسێكی بارگران. (٣) [a-]، پەرتووكی نەخشەی زەوی. (٤) [a-]، پەرتووكێك كە بە نەخشەو وێنەوە باسێك ڕوون بكاتەوە: *( an anatomical ~ )* (٥) [a-]، كاغەزی گەورەی وێنەكردن. (٦) [a-]، بڕبڕەی لاسەرووی مل؛ لاسەرووی گەردەمل. (٧) [a-]، پەیكەری پیاو بەپێوە یا بە چەماوەیی كە لەباتی كۆڵەكە بەكاردێت (خانووسازی).
**atman** (ät′mən), *n.* (١) گیانی مرۆ. (٢) [A-]، گیانی گشت جیهان (كە سەرچاوەی گیانی هەموو ئادەمیزادە).
**atmosphere** (at′məs-fêr′), *n.* (١) بەرگەهەوا؛ هەوای دەوروبەری گۆی زەوی. (٢) هەواو گازی دەوروبەری ئەستێرەو ئەستێرەی گەڕۆك. (٣) چۆنێتی دەوروبەر: *( a nice ~ ; a restaurant with ~ ; There is an ~ of calm and peace in the country that is quite different from the ~ of a big city.)* (٤) پێوانەیەكی پەستانە بریتییە لە ١٤،٦٩ پاوەن لەسەر یەك ئینج دووجا (فیزیا).
**atmospheric** (at′məs-fer′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە بەرگەهەوا؛ تایبەتی بە هەوای دەوروبەری گۆی زەوی: *( ~ disturbances)* . (٢) تایبەتی بە چۆنێتی دەوروبەر.
-**atmospherical** *(adj.)*; **atmospherically** *(adv.)*.
**atmospheric pressure,** پاڵەپەستۆی هەوا؛ پەستانی هەوا.
**atmospherics** (at′məs-fer′iks), *n.pl.* (١) خشەخشی ڕادیۆ (كە لە پاڵەپەستۆی كارەباییەوە لە هەوادا پەیدادەبێت). (٢) هۆی ئەم خشەخشە.
**atoll** (at′ôl, at′ol, ə-tol′), *n.* دوورگەیەكی شیلانی خڕە بەدەوری ئەختێك ئاودا.
**atom** (at′əm), *n.* (١) تۆزقاڵ؛ ئەختال؛ ئەختێك. (٢) ئەتۆم؛ گەردیلەی ئەتۆم؛ سەرچاوەی ووزە.
**atombomb** (at′əm-bom′), *n.* بۆمبای ئەتۆم.
*v.t.* بۆمبای ئەتۆم پیادان.
**atomic** (ə-tom′ik), *adj.* (١) ئەتۆمی: *( ~ bombs)* . (٢) زۆر بچووك؛ بچكۆلە.
**Atomic Age,** چەرخی ئەتۆمی: چەرخی بەكارهێنانی هێزی ئەتۆمی بۆ خێروخۆشی ئادەمیزادو جەنگیش (لە ساڵی ١٩٤٢ بەدواوە).
**atomic bomb,** بۆمبای ئەتۆم؛ بۆمبای گەردیلەیی.
**atomic energy,** ووزەی ئەتۆم؛ هێزی ئەتۆم.
**atomicity** (at′ə-mis′ə-ti), *n.* (١) گەردیلەیێتی؛ لە ئەتۆم پێكهاتن. (٢) (ا) ژمارە یا سەرجەمی گەردیلە لە گەردێكدا. (ب) هاوهێزی (كیمیا).
**atomic number,** ژمارەی ئەتۆمی: ژمارەیەكە بۆ پێناسینی ماددەی كیمیایی‌و پەیوەندی لەگەڵ ماددەكانی تردا بەكاردەهێنرێت.
**atomic theory,** تیۆری ئەتۆمی (كە دەڵێت هەمووشتێك لە گەردیلە پێكهاتووە).
**atomism** (at′əm-iz'm), *n.* تیۆرییەكە دەڵێت: جیهان لە گەردیلە پێكهاتووەو ئەم گەردیلانەش بەش بەش ناكرێن‌و لەناونابرێن.
**atomize** (at′əm-īz′), *v.t.* (١) لەیەك جیاكردنەوەی ئەتۆمەكان. (٢) پارچەپارچەكردن؛ لەیەك جیاكردنەوە. (٣) بە پرژكردنی شلە.
**atomizer** (at′əm-īz′ẽr), *n.* پرژكەر (نامێر)؛ نامێری بەپرژكەری بۆن، دەرمان، یا شلەی تر.
**atomy** (at′ə-mi), *n.* (١) ئەتۆم؛ گەردیلە. (٢) بوونەوەرێكی بچكۆلە.
**atonal** (ā-tōn′'l), *adj.* ناساز (ئاواز، مۆسیقا).
-**atonalism** *(n.)*: **atonality** *(n.)*.
**atone** (ə-tōn′), *v.i. & v.t.* (١) تاوان، گوناه، یا ناهەقی سڕینەوە بە سزاچەشتن؛ سزای خۆ چەشتن؛ گوناه پاكردنەوە بە سزاچەشتن: *( How can I ~ for hurting your feelings?; to ~ for one's wrongdoing)* (٢) [Obs.]، یەك نەوا كردن؛ گونجان؛ هاوئاوازبوون.
**atonement** (ə-tōn′mənt), *n.* (١) گوناه پاكردنەوە بە سزاچەشتن؛ سڕینەوەی تاوان، گوناه، یا ناهەقییەك بە سزاچەشتن: *( This was his ~ for his sins against humanity.)* (٢) [A-]، (ا) سزاچەشتنی عیسا (بە هەڵواسینی) بۆ سڕینەوەی تاوانی ئادەمیزادو خوداڵێخۆشبوونی. (ب) خوداڵێخۆشبوونی ئادەمیزاد.
**atonic** (ə-ton′ik, ā-ton′ik), *adj.* (١) بێ هێز (لەش)؛ لاواز. (٢) هێز نەخراوەسەر (ووشە، بڕگە)؛ نەگیراو. (٣) [Rare]، تایبەتی بە دەنگێكی بەئاستەم بێژراو (دەنگناسی).
*n.* بڕگە یا ووشەیەكی هێز نەخراوەسەر.
**atony** (at′ə-ni), *n.* (١) بێ هێزی (لەش)؛ لاوازی. (٢) هێز نەخستنەسەری بڕگە یا ووشەیەك.
**atop** (ə-top′), *adj., adv. & prep.* لەسەر: *( ~ the tree, house, etc.)*
-**ator** (ā′tẽr), پاشگرێكە بەمانای: بكەر: *(aviator, arbitrator)* .
-**atory** (ə-tôr′i, ə-tō′ri), پاشگرێكە بەمانای: تایبەتی بە: *(explanatory, exclamatory)*
**atrabilious** (at′rə-bil′yəs), *adj. Also* **atrabiliar,** (١) غەمبار؛ هەمیشە دڵتەنگ؛ مات‌ومەلوول. (٢) هەمیشە مەراقی تەندرووستی خۆوو سكاڵاكەری نابەجێ لە دەست نەخۆشی.

**atrium** (ā'tri-əm), *n.* (١) حەوشەی ناوەڕاست یا ژووری سەرەکی خانوویەکی ڕۆمانی کۆن. (٢) داڵان؛ هۆڵی چوونەژوورەوە؛ ڕاڕەو.
(٣) (ا) گوێچکۆلەی دڵ؛ خانە یا بۆشایی ناولەش.
(ب) کون (تونکاری)؛ کەلەبەر؛ ڕاڕەو (لەش).

**atrocious** (ə-trō'shəs), *adj.* (١) دڕندە؛ زۆر دڵڕەق و بەدو پیس؛ بێ بەزەیی: ***( an ~ act)*** .
(٢) [Colloq.]، بێ فەڕ؛ زۆر خراپ؛ ناشرین:
***( an ~ dress, weather, handwriting, etc.)***

**atrocity** (ə-tros'ə-ti), *n.* (١) دڕندەیی؛ بێ بەزەیی و دڵڕەقی؛ بەدی.
(٢) کردەوە یا کاری دڕندانە و بێ بەزەیییانە:
***( Both sides committed ~ies in the war.)***
(٣) [Colloq.]، شتێکی بێ فەڕو ناپەسەند: ***( That picture is an ~ .)*** .

**atrophy** (at'rə-fi), *n.* پووکانەوە؛ ڕزین (ئەندام یا ڕیشاڵی لەش)؛ سیس بوونەوە
*v.i.* پووکانەوە؛ ڕزین (ئەندام یا ڕیشاڵی لەش)؛ سیس بوونەوە.
*v.t.* پووکاندنەوە؛ ڕزاندن (ئەندامی لەش)؛ سیس کردن.

**attach** (ə-tach'), *v.t.* (١) پێوەبەستن؛ پێوەلکاندن؛ پێوەنووساندن؛ دانەدەم؛ بەستنەوە؛ بەستن.
(٢) دانەپاڵ؛ خستنەپاڵ؛ چوونەپاڵ؛ پێوەبەستران:
***( He ~ed himself to us.)***
(٣) لێ نزیک بوونەوە بە هۆی حەزو خۆشەویستییەوە؛ پەیوەندی پەیداکردن.
(٤) ( ~ to )، نانەسەر (ئیمزا)؛ خستنەسەر:
***( He ~ed his signature to the bill.)***
(٥) پێدان (بایەخ)؛ چۆنێتی بینین:
***( He ~es great significance to the news.)***
(٦) دانان بە فەرمان.
(٧) (ا) مووچە یا سامان لێسەندن بە فەرمانی دادگا. (ب) گرتن؛ بەندکردن.
(٨) گواستنەوەی سەردەمی سەربازو ئەفسەر بۆ لقی سەربازی تر:
***( Two new officers have been ~ed to our unit.)***
*v.i.* بەشێك بوون لە؛ لەگەڵدابوون؛ پێوەبەستران (مەجاز):
***( A moral obligation ~es to high rank.)***

**attaché** (at'ə-shā', ə-tash'ā), *n.* لێپرسراوی لقێکی کاروباری باڵیوزخانە (ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەگەری، سوپایی... هتد):
***( cultural ~ ; military ~ ; press ~ )***

**attaché case,** جانتای دەست (بۆ بڕوانامەو نووسراوی گرنگی تر).

**attachment** (ə-tach'mənt), *n.* (١) پێوەبەستن؛ پێوەلکان؛ دانەدەم.
(٢) هۆی پێوەبەستن.
(٣) پەیوەندی هەستی؛ هۆگری؛ خۆشەویستی؛ دۆستایەتی:
***( to form an ~ )***
(٤) شتی پێوەبەستراو؛ کلك (مەجاز).
(٥) نامێری پاشکۆ (بۆ مەکینەیەك یا پێکارێکی کارەبایی).
(٦) (ا) دەستبەسەرداگرتنی زەوی‌وزارو سامانی تر؛ گرتنی مرۆڤ.
(ب) فەرمانی دادگا بۆ ڕێگەپێدانی ئەم دەستبەسەرداگرتنە.

**attack** (ə-tak'), *v.t.* (١) هێرش بردنەسەر؛ پەلاماردان؛ شاڵاو بۆ بردن؛ بەگژداچوون: ***( Our soldiers ~ed the enemy.)*** .
(٢) هێرش بردنەسەر بە دەم یا بە نووسین:
***( His proposal was ~ed in the newspapers.)***
(٣) (ا) هەڵمەت بردنەسەر کارێك یا ئەرکێك؛ دەستپێکردن بە چالاکی:
***( They ~ed the problem of food supply.)***
(ب) تێنیشتن (خواردەمەنی)؛ خواردن:
***( He ~ed his dinner at once.)***
(٤) تووش بوون (نەخۆشی)؛ لێدان:
***( The disease ~ed him suddenly.)***
*v.i.* هێرش بردنەسەر؛ پەلاماردان.
*n.* (١) هێرش؛ پەلامار؛ شاڵاو؛ هەڵمەت.
(٢) تووش بوونی کوتوپڕی نەخۆشی؛ سەکتە:
***( a heart ~ ; an allergy ~ )***
(٣) هەڵمەت بردنەسەر کارێك یا ئەرکێك؛ دەستپێکردن بە چالاکییەك.
(٤) شێوەی ئەم هەڵمەتە یا دەستپێکردنە.

**attain** (ə-tān'), *v.t.* (١) دەستکەوتن؛ هێنانەدی؛ پێگەیشتن (ئامانج)؛ بەجێهێنان (ئاوات): ***( to ~ one's goal, object, etc.)*** .
(٢) گەیشتن (تەمەن): ***( He ~ed the age of ninety.)*** .

**attainability** (ə-tān'ə-bil'ə-ti), *n.* لەوانەبوونی دەستکەوتن؛ بۆهەبوونی بەجێهێنان

**attainable** (ə-tān'ə-b'l), *adj.* دەهێنرێتەدی؛ بەجێ دەهێنرێت؛ دەست دەکەوێت؛ پێگەیشتنی بۆهەیە: ***( an ~ goal)*** .

**attainder** (ə-tān'dēr), *n.* (١) لێسەندنەوەی هەموو مافێکی شارستانی و خاوەنێتی زەوی‌وزارو میرات بردن (لە کەسێك کە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا درابێت). (٢) [Archaic]، سەرشۆڕیی؛ ڕیسوایی.

**attainment** (ə-tān'mənt), *n.* (١) هێنانەدی؛ بەجێهێنان؛ دەستکەوتن؛ بە ئامانج گەیشتن: ***( the ~ of a goal, objective, etc.)***
(٢) ئامانجێکی بەدی هێنراو؛ کارێکی بەجێهێنراو؛ سەرکەوتن.

**attaint** (ə-tānt'), *v.t.* (١) لێسەندنەوەی مافی شارستانی و مافی خاوەنێتی زەوی‌وزارو میرات بردن لە کەسێك کە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا درابێت. (٢) لەکەدارکردن؛ ڕووڕەش کردن.
(٣) [Rare]، پیس کردن؛ تووشی نەخۆشی کردن.
(٤) [Archaic]، گومانبارکردن؛ تاوانبارکردن.
(٥) [Obs.]، تاوانبارکردن لە دادگادا؛ تاوان بەسەردا ساغ کردنەوە.
*n.* (١) لێسەندنەوەی مافی شارستانی (ژمارە یەك ببینە).
(٢) لەکە؛ ڕووڕەشی.

**attainture** (ə-tān'chēr), *n.* = **attainder.**

**attar** (at'ēr), *n.* گوڵاو؛ عەتر.

**attemper** (ə-tem'pēr), *v.t.* (١) گۆڕین؛ گونجاندن؛ کەمکردنەوە یا چاککردن (بە تێکەڵاوکردن).
(٢) گونجاندنی پلەی گەرما؛ کەم‌و زۆرکردنی پلەی گەرما بەپێی پێویست.
(٣) هێمن کردنەوە؛ هێنانەوەسەرخۆ؛ ساردکردنەوە.
(٤) گونجاندن؛ شیاندن؛ لەگەڵ ڕێکخستن.
(٥) [Rare]، ئاودانەوە (کانزا)؛ زاخاودانەوە.

**attempt** (ə-tempt'), *v.t.* (١) هەوڵدان؛ تێکۆشان؛ تەقەلاکردن.
(٢) [Archaic]، هاندان؛ هەڵفریواندن.
*n.* (١) هەوڵ؛ تەقەلا؛ تێکۆشان.
(٢) پەلاماردان بۆ کوشتن؛ هەوڵی کوشتن دان:
***( There was an ~ on the president's life.)***

**attend** (ə-tend'), *v.t.* (١) بەردەستی کردن؛ خزمەت کردن؛ سەرەوکاری کاروبارکردن: ***( He is ~ing the prince.)*** .
(٢) لەگەڵدابوون؛ هاودەمی کردن.
(٣) دەرمان کردن؛ چاودێری کردن (نەخۆش):
***( Which doctor is ~ing you?)***
(٤) پێگەیشتن (ئەنجام)؛ لەگەڵدابوون؛ ئاوەڵکاری کردن:
***( Success ~ed his efforts.)***
(٥) ئامادەبوون لە؛ چوون بۆ: ***( All children over six must ~ school.; He did not ~ the meeting.)***
(٦) [Archaic]، چاوەڕێ کردن.
(٧) [Archaic]، گوێ لێگرتن.
*v.i.* (١) گوێگرتن؛ بەدەربەستەوەهاتن؛ گوێ پێدان.
(٢) ( ~ on; ~ upon )، ئامادەبوون بۆ خزمەت.
**attend to,** خەریك بوون (کار)؛ سەرەوکاری کردن؛ ئاگاداری کردن؛ خۆ بۆ تەرخان کردن؛ چاودێری کردن؛ جێبەجێکردن:
***( Please attend to the matter at once.; to attend to someone's needs)***

**attendance** (ə-ten'dəns), *n.* (١) چاودێری؛ ئاگاداری کردن؛ سەرەوکاری. (٢) ئامادەبوون لە قوتابخانە، کۆڕ، یا شوێنێك.
(٣) ژمارەی بەشداربووان یا ئامادەبووان (کۆبوونەوە، پۆلی قوتابخانە، سینەما، یاریگا... هتد)
**attendant** (ə-ten'dənt), *adj.* (١) چاودێریکەر؛ خزمەتکەر:
*( the ~ nurse)*
(٢) ئامادەبوو لە؛ دیار.
(٣) لەگەڵ؛ لەتەك: *( ~ difficulties)* .
*n.* (١) بەردەست؛ خزمەتکار. (٢) کەسێکی ئامادەبوو لە شوێنێك یا کارێکدا.
(٣) شتی لەگەڵدابوو؛ ئاوەڵ (شت، دۆخ).
**attention** (ə-ten'shən), *n.* (١) سەرنج؛ سەرنجدان؛ گوێگرتن؛ گوێ ڕایەڵی کردن؛ گوێ پێدان:
*( Pay ~ to your teacher.; Pay ~ to what you're doing.)*
(٢) یارمەتی؛ چارەکران:
*( The injured man received ~ at the nearest hospital.)*
(٣) توانای سەرنجدان یا گوێگرتن.
(٤) زمان شیرینی؛ ڕەفتار جوانی لەگەڵ خەڵکدا؛ بەتەنگ خەڵکەوە هاتن.
(٥) (*pl.*)، خاترانە؛ چاکە؛ سەرنج پێدان:
*( A pretty girl usually receives more ~s than a plain girl.)*
(٦) (ا) ووریابوون (مەشقی سەربان). (ب) ووریا بە!.
**come to attention,** ووریابوون (مەشقی سەربان)
**draw one's attention,** سەرنج ڕاکێشان.
**stand at attention,** ووریابوون (مەشقی سەربان).
**attentive** (ə-ten'tiv), *adj.* (١) گوێ ڕاگر؛ گوێگر؛ سەرنجدەر؛ ووریا؛ گوێ ڕایەڵ: *( an ~ audience)* .
(٢) زمان شیرین؛ بەتەنگەوەهاتوو؛ دڵسۆزو دڵ ڕاگر: *( an ~ husband)* .
-attentively *(adv.)*; attentiveness *(n.)*.
**attenuant** (ə-ten'ū-ənt), *adj.* شلکەرەوە (دەرمان)؛ ڕوونکەرەوە.
*n.* ماددەی شلکەرەوە.
**attenuate** (ə-ten'ū-āt'), *v.t.* (١) تەنك کردن؛ بچووك کردنەوە.
(٢) شل کردنەوە؛ ڕوونکردنەوە.
(٣) بێ هێز کردن؛ کەمکردنەوە (توندوتیژی، بایەخ، هێز).
(٤) بێ هێز کردن (میکرۆب)؛ لە کوشندەیی کەمکردنەوە.
*v.i.* ڕوون بوونەوە؛ شل بوونەوە؛ بێ هێز بوون؛ کەم بوونەوە.
*adj.* شل؛ ڕوونکراوە؛ کەم کراوە؛ بێ هێز.
-attenuable *(adj.)*; attenuation *(n.)*.
**attest** (ə-test'), *v.t.* (١) پشتگیری کردنی ڕاستی شتێك؛ لایەنگرتن؛ شایەتی بۆ دان (٢) مۆرکردن (دادگەری)؛ پەسەندکردن.
(٣) پیشاندان؛ دەرخستن؛ بەڵگەبوون بۆ:
*( His rapid promotions ~ed to his ability.)*
(٤) سوێنددان (دادگا).
*v.i.* ( ~ to ), شایەتی بۆ دان: *( I ~ to his innocence.)* .
-attester; attestor *(n.)*.
**attestation** (at'es-tā'shən), *n.* (١) لایەنگری؛ شایەتی بۆ دان.
(٢) شایەتی؛ گەواهی. (٣) بەڵگە.
**Attic** (at'ik), *adj.* (١) تایبەتی بە شاری " ئەسینا " (پایتەختی یۆنان).
(٢) تایبەتی بە " ئەسینا " و دانیشتووەکانی و کلتوورەکەی.
(٣) کلاسیکی؛ سادە (شێوان).
*n.* (١) زمانی یۆنانی " ئەسینا " .
(٢) کەسێکی ئەسینایی.
**attic** (at'ik), *n.* خانەی نێوان بنمیچ و سەربان (لە خانووی سەربان لێژی یۆرتاوابیدا شتوومەکی تێدا هەڵدەگیرێت).
**Attic faith,** بیروباوەڕی پتەوو هیچ کارتێنەکەر.
**attire** (ə-tīr'), *v.t.* پۆشین؛ جلوبەرگ لەبەرکردن؛ جلی جوان لەبەرکردن.
*n.* (١) جلوبەرگی جوان؛ جلوبەرگ.
(٢) شاخی بەرانەکێوی.
**attitude** (at'ə-tōōd', at'ə-tūd'), *n.* (١) پۆز؛ شێوەی وەستان (کە هەست دەردەبڕێت). (٢) هەڵوێست؛ باری هەست بەرامبەر بە دەوروبەر:
*( She has a friendly ~ toward all.; a positive ~ toward life; a negative ~ )*
**attitudinize** (at'ə-dōō'd'n-īz', at'ə-dū'd'n-īz'), *v.i.* پۆز-لێدان.
**attorn** (ə-tūrn'), *v.i.* (١) بەجێهێشتنی دەرەبەگێك و کارکردن بۆ دەرەبەگێکی تر. (٢) بە کرێ گرتنی هەمان زەوی تەناتەت پاش گۆڕانی خاوەنەکەی.
**attorney** (ə-tūr'ni), *n.* پارێزەر؛ نوێنەر (دادگەری).
**power of attorney,** بروانامەی دەسەڵاتی نوێنەری (کە دەیدەیت بە کەسێك بۆ ئیمزاکردن لەباتی خۆت و جێبەجێکردنی کاروبارێك کە خۆت لەوێ نەبیت): *( to give someone power of attorney)* .
**attorney at law,** = attorney.
**attorney general,** (١) پارێزەری گشتی.
(٢) [A- G-]، وەزیری داد لە ئەمەریکا.
**attract** (ə-trakt'), *v.t.* (١) ڕاکێشان بۆ لای خۆ:
*( A magnet ~s iron filing.)*
(٢) دڵفڕاندن؛ دڵ ڕاکێشان: *( Her beauty ~ed people.)* .
(٣) سەرنج ڕاکێشان: *( to ~ attention)* .
**attraction** (ə-trak'shən), *n.* (١) ڕاکێشان؛ دڵ ڕاکێشان.
(٢) هێزی ڕاکێشان. (٣) جوانی؛ دڵفڕێنی.
(٤) شتی دڵفڕێن: *( the ~s of a big city)* .
(٥) یەکتری ڕاکێشان (فیزیا).
**attractive** (ə-trak'tiv), *adj.* جوان؛ دڵفڕێن؛ ئیسك سووك:
*( an ~ girl, place, offer, etc.)*
**attractiveness** (ə-trak'tiv-nis), *n.* جوانی؛ دڵفڕێنی.
**attributable** (ə-trib'yoo-tə-b'l), *adj.* دەدرێتەپاڵ؛ دادەنرێت بە هی کەسێك (ووتە)؛ دادەنرێت بە هۆی شتێك:
*( His success is not ~ to hard work but to good luck.)*
**attribute** (ə-trib'yoot), *v.t.* دانەپاڵ؛ دانان بە هی کەسێك (بەرهەمی هونەری یا نووسین)؛ دانان بە هۆ؛ خستنەمل:
*( The play is ~d to Shakespeare.; He ~s his povery to bad luck.)*
*n.* (١) تایبەخۆ؛ پێناسە؛ سیفەتی تایبەتی:
*( Mercy is an ~ of God.; Politeness is an ~ of a gentleman.)*
(٢) نیشانە: *( The crown is an ~ of Kingship.)* .
(٣) ئاوەڵناو (ڕێزمان).
**attribution** (at'rə-bū'shən), *n.* (١) دانەپاڵ؛ دانان بە هی کەسێك یا بە هۆی شتێك. (٢) تایبەخۆ؛ نیشانە.
**attributive** (ə-trib'yoo-tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە دانەپاڵ.
(٢) نیشانەیی؛ تایبەخۆیی. (٣) ئاوەڵناوی.
*n.* ئاوەڵناو (ڕێزمان).
**attrite** (ə-trīt'), *adj.* [Rare], سووا (بە لێخستن)؛ خووراوە.
**attrition** (ə-trish'ən), *n.* (١) سووان (بە لێخستن)؛ داخوران.
(٢) هێز لێ برین و ماندووکردنی بەردەوام: *( a war of ~ )* .
(٣) پەشیمان بوونەوە لە ترسی سزا (ئاین).
**attune** (ə-tōōn', ə-tūn'), *v.t.* (١) سازکردنی ئامێرێکی مۆسیقا.
(٢) یەك نەوا کردن؛ یەکخستن (ئاوازی مۆسیقا)؛ گونجاندن.
**atwain** (ə-twān'), *adv.* [Archaic or Poetic], بە دوو کەرتەوە:
*( to cut ~ )*
**atypical** (ā-tip'i-k'l), *adj.* نائاسایی؛ ناوێزە؛ بێ وێنە (بۆ کەس یا شتی تر)؛ جیا:
*( He is ~ of his countryman.; This event is ~ of this town.;*

*It is ~ of him to be inconsiderate.)*

**aubade** (ō'bȧd'), ***n.*** مۆسیقای بەیانیان و بەرەبەیان.

**auburn** (ô'bẽrn), ***adj. & n.*** قاوەیی سووریاو.

**au contraire** (ō' kōn'trâr'), بەپێچەوانەوە.

**au courant** (ō' kōō'rän'), ئاگادار؛ ئاگاداری هەموو پووداوێکە.

**auction** (ôk'shən), ***n.*** هەراج؛ مەزات.

***v.t.*** هەراج کردن؛ خستنە مەزاتەوە؛ مەزات کردن.

**auction off,** هەراج کردن؛ مەزات کردن.

**put up for auction,** خستنە مەزاتەوە؛ خستنە هەراجەوە.

**auction bridge,** جۆرێکە لە یاری " بریج " (کە یارییەکی کاغەزە).

**auctioneer** (ôk'shən-ēr'), ***n.*** دەلاڵ؛ مەزاتکەر؛ هەراجچی.

***v.t.*** هەراج کردن؛ مەزات کردن.

**audacious** (ô-dā'shəs), ***adj.*** (١) چاونەترس؛ ئازا؛ بێباک؛ چاوقایم.

(٢) بێ شەرم؛ بێ ئابروو؛ بێ حەیا؛ ڕووهەڵماڵراو.

**audacity** (ô-das'ə-ti), ***n.*** (١) ئازایی؛ چاونەترسی؛ بێباکی.

(٢) ڕووهەڵماڵراوی؛ ڕووهاتن؛ بێ حەیایی؛ بێ ئابڕوویی؛ چاوقایمی.

(٣) کردەوەیەکی بێ ئابڕووانە یا ڕووقایمانە.

**audibility** (ô'də-bil'ə-ti), ***n.*** بەرزی دەنگ و بیسترانی؛ بیستراوی.

**audible** (ô'də-b'l), ***adj.*** ئەوەندە بەرزە دەتوانرێت ببیسترێت؛ دەبیسترێت: *( an ~ sound)* .

**audibly** (ô'də-bli), ***adv.*** بە دەنگی بەرز؛ بە دەنگێکی ئەوەندە بەرز کە ببیسترێت

**audience** (ô'di-əns, ôd'yəns), ***n.*** (١) گوێگران؛ بینەران.

(٢) خوێنەران؛ گوێ لێ گران: *( He writes to a small ~ .)* .

(٣) گوێگرتن؛ گوێ لێ بوون؛ بیستن.

(٤) هەلی ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕ و هەڵوێستی خۆ.

(٥) دیدەنی کەسێکی گەورە: *( to have an ~ with the Pope)* .

**audient** (ô'di-ənt), ***adj.*** گوێگر

**audile** (ô'dil), ***adj.*** تایبەتی بە بیستن؛ تایبەتی بە گوێگرتن.

***n.*** کەسێک کە هەستی بیستنی بەهێزترە لە هەستی بینین و هەستەکانی تری.

**audio** (ô'di-ō'), ***adj.*** (١) دەنگی؛ تایبەتی بە دەنگ.

(٢) تایبەتی بە دەنگ بڵاوکردنەوە.

(٣) تایبەتی بە بیستن.

***n.*** (١) بەشی دەنگ لە تەلەفزیۆنێکدا.

(٢) بڵاوکردنەوە و بیستنی دەنگ؛ ناردن یا وەرگرتنی دەنگ.

(٣) دەنگی بیستراو.

**audio-** (ô'di-ō, ô'di-ə), پێشگرێکە بەمانای: تایبەتی بە بیستن؛ بیستن؛ تایبەتی بە گوێگرتن: *(audiometer, audio-visual)* .

**audiology** (ô'di-ol'ə-ji), ***n.*** زانستی بیستن و نەخۆشی گوێ و بیستن و چارەسەرکردنی.

**audiometer** (ô'di-om'ə-tẽr), ***n.*** پێوەری توانای بیستن یا بەرزی و نزمی دەنگ.

**audio-visual** (ô'di-ō-vizh'ōō-əl), ***adj.*** تایبەتی بە بیستن و بینین؛ تایبەتی بە بیستن و بینین لە فێربووندا.

**audio-visual aids,** هۆی بیستن و بینین (لە فێربووندا)؛ هۆی ڕوونکردنەوە لەڕێی بیستن و بینینەوە (بەتایبەتی لە قوتابخانەدا).

**audiphone** (ô'də-fōn'), ***n.*** ئامێری پێ بیستن (بۆ گوێگرانەکان)؛ بیستۆک

**audit** (ô'dit), ***n.*** (١) پیاچوونەوەی حسابات (کۆمپانیا، بازرگانی)؛ ووردکردنەوەی لیستەی حساب. (٢) پیاچوونەوەی لیستەی باجی کەسێک یا کۆمپانیایەک لەلایەن میرییەوە (تا بزانرێت ئایا باجی تەواویان داوە یان نا).

(٣) برینەوە یا تاووتوێ کردنی حسابات. (٤) حساباتێکی تاوتوێ کراو.

(٥) دوا بەیانی حساباتێک.

***v.t.*** (١) پیاچوونەوەی حسابات (کۆمپانیا، بازرگانی). (٢) (ژمارە دوو ببینە).

(٣) دانیشتن لە پۆلێکی زانکۆداو گوێگرتن بەبێ ئەوەی ئەو کەسە قوتابی بێت لەو پۆلەدا: *( He always ~s a class or two.)* .

**audition** (ô-dish'ən), ***n.*** (١) بیستن؛ گوێ لێ بوون؛ هەستی بیستن؛ گوێگرتن. (٢) دیدەنی ئەکتەر و مۆسیقاژەن بۆ پاکوپیس کردنیان پێش هەڵبژاردنیان بۆ فیلم یا شانۆگەرییەک.

***v.t.*** پاکوپیس کردنی ئەکتەر پێش هەڵبژاردنیان بۆ فیلم یا شانۆگەرییەک:
*( The director ~ed many people for the part.)*

***v.i.*** خۆ پێشکەش کردن بۆ پاکوپیس کران پێش هەڵبژاردن بۆ شانۆگەری یا فیلمێک: *( She ~ed for a few films but never got any part.)* .

**auditor** (ô'də-tẽr), ***n.*** (١) ووردکەرەوەی حسابات؛ پیاچووەوەی لیستەی باج (لەلایەن میرییەوە). (٢) گوێگر.

(٣) قوتابی گوێگر (لە پۆلێکی زانکۆدا بەبێ ئەوەی قوتابی بێت لەو پۆلەدا)؛ گوێگر (دانشگا).

**auditorium** (ô'də-tôr'i-əm, ô'də-tō'ri-əm), ***n.*** (١) هۆڵی گوێگرتن (قوتابخانە، کڵێسە، سینەما).

(٢) هۆڵی گشتی کۆنفرانس؛ هۆڵی کۆبوونەوە.

**auditory** (ô'də-tôr'i, ô'də-tō'ri), ***adj.*** تایبەتی بە بیستن؛ تایبەتی بە هەستی بیستن؛ بیستەنی: *( the ~ nerve)* .

***n.*** (١) گوێگرتووان (ئاهەنگی مۆسیقا، ووتار... هتد)؛ بینەران.

(٢) **auditorium** .

**au fait** (ō' fe'), شارەزا؛ کارامە.

**au fond** (ō' fōn'), لەناوجەرگەکەیەوە؛ لەناوکرۆکەکەیدا؛ لەگەوهەردا.

**auf weidersehen** (ouf vē'dẽr-zā'ən), خواحافیز (هەتاکو بەیەکتری دەگەینەوە).

**Aug.**, = **August.**

**augend** (ô'jend, ô-jend'), ***n.*** ژمارەیەکە کە ژمارەیەکی تری بۆ زیادکرابێت یا خرابێتەسەری.

**auger** (ô'gẽr), ***n.*** درەوش؛ درەوش.

**aught** (ôt), ***n.*** [Archaic], (١) شتێک؛ هەرچ شتێک:
*( What's ~ but as 'tis valued?)*

(٢) سفر؛ هیچ.

***adv.*** هیچ؛ بە هیچ جۆرێک.

**augment** (ôg-ment'), ***v.t.*** (١) گەورەکردن؛ بەهێزکردن؛ زۆرکردن؛ زیادکردن: *( to ~ one's income, influence, etc.; to ~ its forces)* .

(٢) درێژکردنەوەی دەنگ (ڕێزمان).

***v.i.*** زۆربوون؛ زیادبوون؛ گەورەبوون.

***n.*** (١) زیادە؛ زۆربوون. (٢) درێژکردنەوەی تیپەبزوێنی سەرەتایی یا کردنی پیتەبزوێنێکی زیادە بە پێشگری کردار بۆ پیشاندانی کاتی ڕابوردوو لە زمانی سانسکریتی و یۆنانیدا (ڕێزمان).

**augmentation** (ôg'men-tā'shən), ***n.*** (١) زیادکردن؛ زیادبوون؛ گەورەکردن. (٢) زیادە؛ شتی خراوەسەر.

**augmentative** (ôg-men'tə-tiv), ***adj.*** (١) زیادبوو؛ زۆر دەکرێت؛ توانای زیادبوونی هەیە. (٢) بەهێزکەری ووشە یا مانا: *( an ~ prefix)* .

***n.*** پێشگر، پاشگر، یا بەهێزکەری مانای ووشە (ڕێزمان):
*( Perdurable; eat up)*

**augur** (ô'gẽr), ***n.*** نوقلانەلێدەر؛ بۆقرێنەر؛ پێشبینیکەر.

***v.t. & v.i.*** (١) نوقلانەلێدان؛ بۆقراندن؛ پێشبینی کردن.

(٢) نیشانەی شتێک بوون (باش یا خراپ) لە دواڕۆژدا:
*( It ~s well for us.; It ~ ill for us.)*

**augur ill,** نیشانەیەکی بەدووم یا خراپە؛ نیشانەی ئەهاتە.

**augur well,** نیشانەیەکی باشە؛ نیشانەی بهاتە.

**augury** (ô'gyẽr-i), ***n.*** (١) نوقلانەلێدان؛ پێشبینی کردن.

(٢) کۆڕی خۆ تیادانواندنی نوقلانەلێدەرێک یا پێشبینیکەرێک.

(٣) نیشانەی بهات یا ئەهات.

**August** (ô'gəst), ***n.*** مانگی هەشتەمی ساڵنامەی فەرەنگی؛ ئاب؛ گەلاوێژ.

**august** (ô-gust′), ***adj.*** شکۆدار؛ بەشکۆ؛ بەسام؛ بەرز؛ پایەبەرز؛ بڵند؛ پیرۆز؛ بەڕێز.
**auk** (ôk), ***n.*** ئۆك: باڵندەیەکی قاچ تەنراوی کلك و باڵ کورتی قەڵەوە لە دەریاکانی باکووردا دەژی.
**au lait** (ō′ le′), بە شیرەوە (قاوە یا چا).
**auld** (ôld), ***adj.*** [Dial. & Scot.], = **old.**
**au naturel** (ō′ nå′tü′rel′), (١) سرووشت ناسایی. (٢) ڕووت. (٣) سادە (خواردەمەنی)؛ بە ڕووتی کوڵاو؛ نەڕازێنراوە (خواردەمەنی)؛ نەکوڵاو
**aunt** (ant, änt), ***n.*** پوور؛ میمك
**auntie, aunty** (an′ti, än′ti), ***n.*** پوور (لەڕووی خۆشەویستی یا زۆر لێوە نزیك بوونەوە).
**aura** (ô′rə), ***n.*** (١) شتێکی نەبینراو لە هەوادا (وەك بۆنی گوڵ). (٢) تایبەخۆیەکە لە کەسێك دەبارێت: (فلان کەس پیرۆزیی لێ دەبارێت)؛ هەستێکی تایبەتی کە لە کەسێك یا شتێك دەبێتەوەو خەڵك هەستی پێ دەکەن؛ تریفە: *( He has an ~ of grandeur about him.)*. (٣) تەوورژمی بای پەیدابوو لە تەووژمێکی کارەباوە. (٤) مووچڕکە؛ تەزوو (کە بە لەشدا دێت پێش فێ لێهاتن).
**-aural** *(adj.).*
**aural** (ô′rəl), ***adj.*** تایبەتی بە گوێ و هەستی بیستن؛ دەبیسترێت؛ تایبەتی بە بیستن.
**aureate** (ô′ri-it), ***adj.*** (١) زێڕی؛ زێڕین؛ زەرکەش کراو. (٢) ڕازاوە؛ زۆر جوان؛ نایاب.
**aureola** (ô-rē′ə-lə), ***n.*** = **aureole.**
**aureole** (ô′ri-ōl′), ***n.*** (١) تریفەی دەوری سەری پیاوچاکان (ئاین). (٢) خەرمانەی مانگ یا ڕۆژ.
**aureomycin** (ô′ri-ō-mī′sin), ***n.*** ئۆریۆمایسین: دەرمانێکی میکرۆب کوژە وەك پەنسلین وایە.
**au revoir** (ō′ rə-vwår′), [Fr.], خواحافیز (هەتا یەکتری دەبینینەوە).
**auri-** (ô′ri), پێشگرێکە بەمانای: گوێ: *(auriform)*.
**auric** (ô′rik), ***adj.*** زێڕی؛ زێڕین؛ زێڕی تێدایە
**auricle** (ô′ri-k′l), ***n.*** (١) کرکراگەی گوێ (٢) گوێچکۆلەی دڵ؛ یەکێکە لە دوو بۆشاییەکەی سەرەوەی دڵ. (٣) ئەندامێکی لە گوێچکە چوو (ڕووەك، گیاندار).
**auricula** (ô-rik′yoo-lə), ***n.*** (١) گوڵەبەهارە (گەڵاکانی لە گوێی وورچ دەچن) (٢) **auricle**.
**auricular** (ô-rik′yoo-lēr), ***adj.*** (١) تایبەتی بە بیستن؛ تایبەتی بە گوێ (٢) بەگوێدا چرپێنراو؛ نهێنی: *( an ~ confession)*. (٣) لە گوێ دەچێت. (٤) تایبەتی بە گوێچکۆلەی دڵ (تونکاری). (٥) *(pl.)*. پەڕی کونەگوێچکەی باڵندە
**auriculate** (ô-rik′yoo-lit), ***adj.*** (١) گوێچکەدار: *( an ~ leaf)*. (٢) لە گوێ دەچێت.
**auriferous** (ô-rif′ēr-əs), ***adj.*** زێڕی؛ زێڕی تێدایە؛ زێڕی لێ دەردەهێنرێت (بەرد، زیخ).
**auriform** (ô′ri-fôrm′), ***adj.*** لە گوێ دەچێت
**aurist** (ô′rist), ***n.*** پزیشکی گوێ
**aurochs** (ô′roks), ***n.*** (١) کەڵەگایەکی کێویی ئەورووپایی بنەبڕبووە. (٢) کەڵەگای کێویی ئەورووپایی.
**Aurora** (ô-rôr′ə, ô-rō′rə), ***n.*** (١) بانووخوای بەرەبەیان (ئەفسانەی ڕۆمانی). (٢) [a-]، بەرەبەیان؛ شەبەق؛ بەیانی. (٣) [a-]. سەرەتا (کار، شت).
**aurora australis,** تیشکی باشوور: ڕووناکییەکە لە ئاسمانی ناوچە باشوورییەکاندا بە شەوو بەرەبەیان دەبینرێت. (هەروەها پێشی دەووترێت: " **southern lights** ").
**aurora borealis,** تیشکی باکوور: ڕووناکییەکە لە ئاسمانی ناوچە باکوورییەکاندا بە شەوو بەرەبەیان دەبینرێت.
**auroral** (ô-rôr′əl, ô-rō′rəl), ***adj.*** (١) بەرەبەیانی؛ ڕووناك؛ سوور وەك ڕەنگی شەبەق. (٢) شەوقدەرەوە؛ تیشکدار؛ تیشکدەرەوە.
**aurorean** (ô-rôr′i-ən, ô-rō′ri-ən), ***adj.*** = **auroral.**
**aurous** (ô′rəs), ***adj.*** (١) زێڕین؛ زێڕی تێدایە. (٢) بەشێکی زێڕە (ئاوێتەی کیمیایی).
**aurum** (ô′rəm), ***n.*** زێڕ؛ ئاڵتوون.
**auscultate** (ôs′kəl-tāt′), ***v.t. & v.i.*** تاقیکردنەوەی سنگ و دڵ بە گوێ لێ گرتنیان بە بیستۆك (پزیشکەوانی).
**auscultation** (ôs′kəl-tā′shən), ***n.*** (١) گوێگرتن. (٢) گوێ لە دەنگی دڵ و سنگ و سك گرتن بە بیستۆك (پزیشکەوانی).
**auspex** (ôs′peks), ***n.*** قەشەیەکی ڕۆمانییە کە نیشانەی بهات و نەهاتی لە فڕینی باڵندەدا دیوە.
**auspicate** (ôs′pi-kāt′), ***v.t.*** بەردی بناغە دانان بە ئاهەنگ بۆ بهاتی؛ کردنەوە (پرۆژە).
**auspice** (ôs′pis), ***n.*** (١) نیشانەی دواڕۆژ (بهات یا نەهات). (٢) پێشبینی کردنی نیشانەی دواڕۆژ لە فڕینی باڵندەدا. (٣) پێشبینی (بەتایبەتی هی بهات). (٤) *(pl.)*، چاودێری؛ سەرپەرشتی؛ سایە؛ ئامۆژگاری: *( The conference is being held under the ~s of the United-Nations.)*
**auspicious** (ôs-pish′əs), ***adj.*** بهات؛ هات؛ باش و سەرکەوتوو (نیشانەی دواڕۆژ)؛ لەبار: *( an ~ sign, beginning, etc.)*.
**austere** (ô-stêr′), ***adj.*** (١) توندوتیژ؛ بەزەبر: *( an ~ man)*. (٢) مۆن؛ گرژ؛ مڕومۆچ: *( an ~ face)*. (٣) سۆفییانە؛ ووشك (ژیان): *( an ~ life)*. (٤) دەست بەخۆوەگر (پارە). (٥) سادە؛ نەڕازاوە (ماڵ، شوێن)؛ ڕووت و قووت: *( an ~ room, house, office, etc.)*
**austerity** (ô-ster′ə-ti), ***n.*** (١) توندوتیژی؛ زەبر. (٢) گرژی؛ مڕومۆنی. (٣) سۆفێتی؛ خۆگرتن (لە خۆشی). (٤) سادەیی؛ ڕووت و قووتی؛ نەڕازاوەیی (خانوو، شوێن). (٥) سك هەڵ ووشین؛ دەست بەخۆوەگرتن (پارە خەرج کردن): *( The government will impose ~ measures.)* (٦) *(pl.)*، کارێکی توندوتیژ یا دڵڕەقانە؛ خووی شت لە دەم خۆ گرتنەوە.
**austral** (ôs′trəl), ***adj.*** (١) باشووری؛ خواروو. (٢) [A-]، ئوستورالی.
**Australian** (ô-strāl′yən), ***adj.*** ئوستورالی (گەل، زمان، کلتوور).
***n.*** ئوستورالییەك؛ هاووڵاتییەکی ئوستورالیا.
**Austrian** (ôs′tri-ən), ***adj.*** نەمساوی (گەل، زمان، کلتوور).
***n.*** (١) نەمساوییەك؛ هاووڵاتییەکی نەمسا. (٢) زمانی نەمساوی (کە بەشێکە لە زمانی ئەڵمانی).
**austro-** (ôs′trō, ôs′trə), پێشگرێکە بەمانای: (١) بای باشووری: *(austro wind)* (٢) [A-]، باشووری. (٣) [A-]، ئوستورالی.
**autacoid** (ô′tə-koid′), ***n.*** *Also* **autocoid,** هۆرمۆن.
**autarchy** (ô′tär-ki), ***n.*** (١) ڕژێمی زۆردارەکی؛ بێ جڵەوی؛ بێ پایانی؛ ڕەهایی. (٢) وڵاتێك کە لەژێر ڕژێمی زۆردارەکیدا بێت. (٣) **autarky**.
**-autarchic; autarchical** *(adj.).*
**autarky** (ô′tär-ki), ***n.*** (١) خۆبەس بوونی ئابووری (وڵات)؛ پشت بە خۆ بەستن و هیچ لە دەرەوە نەهێنان. (٢) وڵاتێکی وەها.
**-autarkic** *(adj.).*
**authentic** (ô-then′tik), ***adj.*** (١) ڕاست؛ درۆی تێدا نییە؛ بێ گومان:

*( an ~ news report)*

(۲) ڕاستەقینە؛ ڕەسەن: *( an ~ document, signature, etc.)* .

**authenticate** (ô-then′ti-kāt′), *v.t.* (۱) ساغ کردنەوە (ڕاستی و درۆیی شتێک): *( to ~ a story or a report)* .

(۲) ساغ کردنەوە (ڕەسەنی شتێک، نووسەرێتی یا نیگارکێشی... هتد):
*( to ~ the authorship of an old poem)*

(۳) مۆرکردن (قەواڵە، بڕوانامە).

-authenticated *(adj.)*; authentication *(n.)*;
authenticator *(n.)*.

**authenticity** (ô′thən-tis′ə-ti), *n.* ڕاستی و درۆیی؛ ڕاستێتی؛ ڕاستەقینەیی؛ ڕەسەنی: *( to prove the ~ of a story, document, signature, etc.)*

**author** (ô′thēr), *n.* (۱) داهێنەر؛ دانەر؛ دروستکەر.
(۲) نووسەر؛ دانەر (پەرتووک، چیرۆک، وتار).

*v.t.* (۱) داهێنان؛ دانان.
(۲) نووسین *( He has ~ed several books and articles.)* .

**authoress** (ô′thēr-is), *n.* [Rare], (۱) دانەر (ئافرەت)
(۲) نووسەر (ئافرەت).

**authorial** (ô-thôr′i-əl, ô-thō′ri-əl), *adj.* تایبەتی بە نووسەر یا داهێنەر.

**authoritarian** (ə-thôr′ə-târ′i-ən), *adj.* زۆردار؛ زۆردارەکی؛ دیکتاتۆری: *( an ~ ruler, government, etc.)* .

*n.* کەسێکی زۆردار، زاڵم، یا دیکتاتۆر؛ کەسێک کە بڕوای بە زوڵم‌وزۆر هەبێت.

**authoritarianism** (ə-thôr′ə-târ′i-ən-iz′m), *n.* بیروباوەڕی زۆردارەکی؛ ڕژێمی زۆردارەکی؛ دیکتاتۆرێتی.

**authoritative** (ə-thôr′ə-tā′tiv), *adj.* (۱) حەزکەر لە فەرماندان؛ زۆردار؛ دیکتاتۆری. (۲) ڕەسمی؛ بەدەسەڵات؛ لە لایەکی دەسەڵاتدارەوە دەرچووە (فەرمان). (۳) بڕواپێکراو؛ جێگەی بڕوا؛ پشتی پێ دەبەسترێت (چونکە شارەزایان کردوویانە):
*( an ~ source, report, etc.; an ~ dictionary)*

**authority** (ə-thôr′ə-ti), *n.* (۱) مافی فەرماندان یا جێبەجێکردن؛ دەسەڵات: *( Kurdish parents have more ~ over their children than parents in America.)*

(۲) دەسەڵات پێدان؛ ڕێگەپێدان: *( He has my ~ to do it.)* .

(۳) دەسەڵاتێک کە لە شارەزایی یا پایەبەرزییەوە هاتبێت.

(٤) *(pl.)*، کاربەدەست؛ فەرمانبەر؛ میری؛ فەرمانڕەوایی:
*( The local ~ies are in charge.)*

(٥) بەڵگە؛ سەرچاوەی بەڵگە لێوە وەرگرتن:
*( What's your ~ for that statement?)*

(٦) شارەزای ڕشتەیەکی تایبەتی؛ کەسێکی سەردەرچوو یا شارەزا:
*( He is an ~ on plants.)*

(۷) سەرچاوەی بڕواپێکراو یا پشت پێ بەستراو:
*( The "Oxford English Dictionary" is the best ~ on English words.)*

**authorization** (ô′thēr-i-zā′shən), *n.* (۱) دەسەڵات پێدان؛ دەسەڵات پێدران. (۲) ڕێگەپێدان. (۳) دەسەڵاتنامە؛ دەسەڵات.

**authorize** (ô′thə-rīz′), *v.t.* (۱) دەسەڵات پێدان؛ سەرپشک کردن:
*( I have ~d him to act for me while I am abroad.)*

(۲) ڕێگەپێدان؛ پاس پێدان: *( The city ~d a housing project.)* .

**authorized** (ô′thə-rīzd′), *adj.* (۱) ڕێگەپێدراو (بەپێی یاسا).
(۲) دەسەڵات پێدراو؛ سەرپشک کراو: *( an ~ representative)* .

**authorship** (ô′thēr-ship′), *n.* (۱) پیشەی نووسەر؛ نووسین؛ دانان (پەرتووک، نووسراو). (۲) نووسەر، دانەر، یا سەرچاوەی پەرتووکێک:
*( Nothing is known of the ~ of the Arabian Nights.)*

(۳) سەرچاوەی بیرێک یا دۆزەرەوەکەی.

**autism** (ô′tiz′m), *n.* خەیاڵ پەرستی (دەروونناسی)؛ زەرەخەوبینین و بیر هەر لە خۆ کردنەوە و گوێ نەدان بە هیچی تر؛ نەخۆشییەکە بەتایبەتی لە منداڵاندا بریتییە لە نەگونجان لەگەڵ دەوروبەردا و گۆشەگیری و داڵغەلێدان و ڕاکردن لە ژیان.

**autistic** (ô-tis′tik), *adj.* گۆشەگیر و داڵغەلێدەر (دەروونناسی)؛ خەیاڵ پەرست: *( an ~ child)* .

**auto** (ô′tō), *n.* [Colloq.], = **automobile.**

*v.i.* بە ئوتومبیل ڕۆیشتن؛ سواری ئوتومبیل بوون.

**auto-** (ô′tō, ô′tə), پێشگرێکە بەمانای: (۱) خۆ: *(autism)* .
(۲) تایبەتی بە خۆ؛ هی خۆ: *(autobiography)* .
(۳) خۆکرد؛ ناوەکی؛ لەخۆوە: *(auto-suggestion)* .
(٤) خۆبزوێن: *(automobile)* .

**autobiographer** (ô′tə-bī-og′rə-fēr), *n.* بەسەرهاتی خۆنووس؛ ژیاننامەی خۆنووس.

**autobiographic** (ô′tə-bī′ə-graf′ik), *adj.* (۱) تایبەتی بە ژیاننامەی خۆ؛ لەبابەت ژیانی خۆوە؛ دەربارەی بەسەرهاتی خۆ.
(۲) لەسەر ژیاننامەی خۆ دانراوە: *( an ~ novel)* .

**autobiographical** (ô′tə-bī′ə-graf′i-k'l), *adj.* = **autobiographic.**

**autobiographically** (ô′tə-bī′ə-graf′i-k'l-i), *adv.* (۱) وەک ژیاننامەی خۆ؛ بەشێوەی ژیاننامەی خۆ.
(۲) لەڕێی ژیاننامەی خۆوە.

**autobiography** (ô′tə-bī-og′rə-fi), *n.* نووسینی ژیاننامەی خۆ؛ نووسینی بەسەرهاتی ژیانی خۆ؛ ژیاننامەی خۆ.

**autobus** (ô′tə-bus′), *n.* [Rare], پاس؛ پاسی ناوشار.

**autochthon** (ô-tok′thən), *n.* (۱) کەسێکی خۆوڵاتی؛ خۆوڵاتی.
(۲) دانیشتووی بنەچەیی یا سەرەتایی ناوچەیەک؛ دانیشتووی کۆنی شوێنێک.

-autochthonic; autochthonous *(adj.)*.

**autoclave** (ô′tə-klāv′), *n.* مەنجەڵێک یا دەفرێکی کونبڕە بۆ پاکژکردن یا چێشت لێنان بەکاردەهێنرێت.

*v.t.* پاکژکردن یا چێشت لێنان بەم جۆرە دەفرە یا مەنجەڵە.

**autocracy** (ô-tok′rə-si), *n.* (۱) ئۆتۆکراسی؛ دیکتاتۆرێتی؛ فەرمانڕەوایی یەک کەسی؛ ڕژێمی زوڵم‌وزۆر؛ زۆردارەکی.
(۲) وڵاتێک کە ئەم جۆرە ڕژێمەی هەبێت.
(۳) دەسەڵاتی بێ جڵەو، بێ سنوور، بەربەرەڵا، یا بێ پایان.

**autocrat** (ô′tə-krat′), *n.* (۱) ئۆتۆکرات؛ زۆردار؛ دیکتاتۆر.
(۲) کەسێک کە دەسەڵاتی بێ سنوور یا بێ پایانی هەبێت بەسەر خەڵکی تر یا وڵاتەکەیدا. (۳) کەسێکی بەزەبر، کەڵە، یا زۆردار.

**autocratic** (ô′tə-krat′ik), *adj.* ئۆتۆکراتی؛ دیکتاتۆری؛ زۆردار؛ پڕ زوڵم‌وزۆر: *( an ~ rule)* .

-autocratical *(adj.)*; autocratically *(adv.)*.

**auto-da-fé** (ô′tō-də-fā′), *n.* (۱) ئاهەنگی سزا بەسەردادان و هەڵواسینی خوانەناسێک (لە دادگا ئاینییەکانی ئیسپانیای کۆندا).
(۲) سووتاندنی خوانەناسێک لەبەرچاوی جەماوەردا.

**autoecious** (ô-tē′shəs), *adj.* هەموو ژیانی بەسەر یەک شت یا شوێنەوە دەباتەسەر (خۆرە، مشەخۆر، کەڕوو).

**autoeroticism** (ô′tō-i-rot′ə-siz′m), *n.* = **autoerotism.**

**autoerotism** (ô′tō-er′ə-tiz′m), *n.* ئاوی خۆ هێنانەوە؛ دەستپەڕ؛ خۆ ڕەحەت کردن.

-autoerotic *(adj.)*.

**autogamous** (ô-tog′ə-məs), *adj.* خۆپیتێن (ڕووەکناسی)؛ خۆ چاک کردن (ڕووەک).

**autogamy** (ô-tog′ə-mi), *n.* خۆپیتاندن (ڕووەکناسی)؛ خۆ چاک کردن (ڕووەک).

**autogenesis** (ô′tō-jen′ə-sis), *n.* لەخۆوە پەیدابوون؛ پەیدابوونی

زیندەوەر لە شتی نازیندووەوە؛ لەخۆوە دەرکەوتن یا زیادبوون.

**autogenetic** (ô´tō-jə-net′ik), *adj.* لەخۆوە پەیدابوو؛ لەخۆوە زیادبوو.

-autogenetically *(adv.).*

**autogenous** (ô-toj′ə-nəs), *adj.* (١) لەخۆوە پەیدابوو؛ لەخۆوە- زیادکەر (٢) لە لەشی نەخۆشەکە خۆیەوە پەیدادەبێت یا وەردەگیرێت:

*( An ~ vaccine is one obtained from the patient's body.)*

**autogeny** (ô-toj′ə-ni), *n.* = autogenesis.

**autogiro** (ô´tə-jī′rō), *n.* جۆرە هێلیکۆپتەرێکی کۆنە

**autograph** (ô′tə-graf´, ô′tə-gräf´), *n.* (١) ئیمزای کەسێك کە بە دەستی خۆی کردبێتی؛ ئیمزا: *( to get a famous person's ~ )*. (٢) دەستنووس.

*v.t.* (١) دەستنووس کردن؛ بە دەستی خۆ نووسین. (٢) ئیمزاکردن؛ ئیمزای خۆ لەسەردانان:

*( He ~ed a copy of his book for her.)*

**autography** (ô-tog′rə-fi), *n.* (١) ئیمزاکردن؛ دەستنووس کردن؛ دەستنووسکاری. (٢) دەست‌وخەت؛ دەستنووسی خۆ. (٣) دەستنووس‌و ئیمزا پێکەوە.

**autohypnosis** (ô´tō-hip-nō′sis), *n.* خۆنووراندنی موگناتیسی.

-autohypnotic *(adj.).*

**autoinfection** (ô´tō-in-fek′shən), *n.* لەخۆوە یا خۆبەخۆ نەخۆشی گرتن (لە میکرۆبێکەوە کە دەمێکە لە لەشدا بووە، بەڵام تا ئێستا سست‌و لاواز بووە)؛ خۆبەخۆ تووشی نەخۆشی کردن.

**autoinoculation** (ô´tō-in-ok´yoo-lā′shən), *n.* (١) کوتانی خۆیی: کوتانی نەخۆش بە دەرمانێك کە لە لەشی خۆیەوە وەرگیراوە. (٢) بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەك لە ئەندامێکی لەشەوە بە ئەندامەکانی تردا؛ نەخۆشییەکی تازە کە لە نەخۆشییەکی کۆنەوە تووشی هەمان لەش دەبێت.

**autointoxication** (ô´tō-in-tok´sə-kā′shən), *n.* ژەهرلێدانی لەش لە خۆی؛ خۆژەهراوی کردنی لەش.

**autoist** (ô′tō-ist), *n.* ئوتومبیلچی؛ ئوتومبیل لێخوڕ.

**autokinetic** (ô´tō-ki-net′ik, ô´tō-kī-net′ik), *adj.* خۆبزوێن.

**autoloading** (ô′tə-lōd´iŋ), *adj.* نیوئۆتۆماتیکی (چەکی ئاگرین)؛ فیشەکە خۆ داگرەوە: *( ~ firearms)*.

**autolysin** (ô´tə-lī′sin), *n.* خۆدارزێن: ماددەیەکە ڕیشاڵی ئەو زیندەوەرە دادەڕزێنێت کە تێیدا پەیدادەبێت.

**autolysis** (ô-tol′ə-sis), *n.* خۆ خۆدارزاندن: دارزانی ڕیشاڵەکانی لەش لەلایەن شتی ناوخۆیانەوە پاش مردن یا نەخۆش کەوتن.

**automat** (ô′tə-mat´), *n.* چێشتخانەی ئۆتۆماتیکی: چێشتخانەیەکە خواردەمەنییەکانی لە مەکینەدایە پارەی تێ دەخرێت‌و خواردنەکەی لێوە دێتە دەرەوە.

**automata** (ô-tom′ə-tə), *n. plural of* automaton.

**automate** (ô′tə-māt´), *v.t.* کردن بە ئۆتۆماتیك (کارگە، مەکینە).

**automatic** (ô´tə-mat′ik), *adj.* (١) ئۆتۆماتیکی؛ خۆبزوێن؛ خۆکار:

*( ~ machinery)*

(٢) لەخۆوە ڕوودان بەبێ بیرلێکردنەوە یا ویستن:

*( Breathing is usually ~ .)*

*n.* (١) چەکی ئاگرینی ئۆتۆماتیکی. (٢) ئامێری خۆکار؛ مەکینەی ئۆتۆماتیکی.

-automatically *(adv.).*

**automatic pilot,** ئامێری لێخوڕینی فڕۆکە بە ئۆتۆماتیکی، واتە بەبێ دەستکاری کردنی فڕۆکەوانەکە؛ فڕۆکەوانی خۆکار.

**automatic pistol (or rifle),** دەمانچە یا تفەنگی ئۆتۆماتیکی، واتە خۆداگرەوە.

**automation** (ô´tə-mā′shən), *n.* ئۆتۆماتیککاری (کشتوکاڵ، کارگە)؛ کردن بە ئۆتۆماتیك:

*( the ~ of industry and agriculture)*

**automatism** (ô-tom′ə-tiz′m), *n.* (١) خۆبزوێنی؛ خۆکاری؛ ئۆتۆماتیکیێتی. (٢) کارێکی ئۆتۆماتیکی (بەبێ بیرلێکردنەوە). (٣) تیۆرییەکە دەڵێت: کە کردەوەی مرۆڤ بە دەست مێشك‌و بیرکردنەوە نییە بەڵکو سەربەخۆیە. (٤) بزووانی خۆکاری ئەندامی لەش (چاوفڕین، دڵ لێدان). (٥) پێشێل کردنی هۆشی بەئاگا بۆ دەربڕینی هۆشی بێ ئاگا لەڕێی هونەرەوە.

**automaton** (ô-tom′ə-ton´, ô-tom′ə-tən), *n.* (١) مەکینەیەکی خۆبزوێن؛ شتێکی خۆبزوێن. (٢) مرۆڤی ئۆتۆماتیکی: مەکینەیەکی خۆبزوێنە لەشێوەی مرۆڤدا. (٣) مرۆڤێکە هەر وەك مەکینە بە ڕۆتینی‌و بێ بیرکردنەوە کاردەکات.

**automobile** (ô′tə-mə-bēl´, ô′tə-mō´bēl), *n.* ئوتومبیل.

*adj.* (١) خۆبزوێن؛ خۆکار؛ ئۆتۆماتیکی. (٢) تایبەتی بە ئوتومبیل.

**automotive** (ô´tə-mō′tiv), *adj.* (١) خۆبزوێن؛ خۆکار. (٢) تایبەتی بە ئوتومبیل: *( ~ parts)*.

**autonomic** (ô´tə-nom′ik), *adj.* (١) سەربەخۆیی ناوخۆیی هەیە؛ سەربەخۆ؛ خودموختار. (٢) تایبەتی بەو بەشەی مێشك کە لێپرسراوی ئەندامە خۆبزوێنەکانە وەك دڵ‌و ڕیخۆڵە‌و ڕژێنەکان. (٣) لەخۆوە پەیدادەبێت.

-autonomical *(adj.).*

**autonomic nervous system,** ئەو بەشەی مێشك یا کۆئەندامی دەمارە کە لێپرسراوی ئەندامە خۆبزوێنەکانە وەك دڵ‌و ڕیخۆڵە‌و ڕژێنەکان.

**autonomist** (ô-ton′ə-mist), *n.* سەربەخۆیی ناوخۆ خواز؛ لایەنگری سەربەخۆیی ناوخۆ.

**autonomous** (ô-ton′ə-məs), *adj.* (١) سەربەخۆیی ناوخۆیی هەیە؛ سەربەخۆ: *( an ~ state, region, etc.)*. (٢) سەربەخۆ کاردەکات (زیندەوەرناسی). (٣) لەخۆوە پەیدادەبێت (ڕووەکناسی).

**autonomy** (ô-ton′ə-mi), *n.* (١) ئۆتۆنۆمی؛ سەربەخۆیی ناوخۆ. (٢) هەرێمێکی سەربەخۆ؛ وڵاتێکی سەربەخۆ.

**autoplasty** (ô′tə-plas´ti), *n.* پینەکردنی لەش بە ڕیشاڵی خۆی (نەشتەرگەری).

-autoplastic *(adj.).*

**autopsy** (ô′top-si, ô′təp-si), *n.* یەکلاکردنەوە یا توێکاری کردنی لاشەی مردوو بۆ دۆزینەوەی هۆی مردنەکەی.

**autosuggestion** (ô´tō-səg-jes′chən), *n.* بە خۆ ووتن؛ بە خۆ واووتن؛ بە خۆ ڕاگەیاندن (بۆ کردنی کارێك یا پەسەندکردنی شتێك).

-autosuggestible *(adj.)*; autosuggestive *(adj.).*

**autotomy** (ô-tot′ə-mi), *n.* فڕێدان یا لێبوونەوەی ئەندامێکی لەش بۆ خۆپاراستن (وەك کلکی مارمێلکە).

**autotoxemia, autotoxaemia** (ô´tō-tok-sē′mi-ə), *n.* = autointoxication.

**autotransformer** (ô´tō-trans-fôr′mēr), *n.* گۆڕەری خۆکار یا ئۆتۆماتیکی (کارەبا).

**autotroph** (ô′tə-trof´), *n.* ڕووەکێکە کە خۆی خواردنی خۆی دروست دەکات.

-autotrophic *(adj.).*

**autotruck** (ô′tō-truk´), *n.* لۆری؛ ئوتومبیلی بارهەڵگر.

**autoxidation** (ô-tok´sə-dā′shən), *n.* ژەنگ هەڵهێنان بە هەوا بەرکەوتن (کیمیا).

**autumn** (ô′təm), *n.* (١) پاییز. (٢) پیری؛ سەردەمی پیری.

*adj.* پاییزە؛ پاییزی.

**autumnal** (ô-tum′n'l), *adj.* (١) پاییزی؛ پاییزە. (٢) لە پاییزدا پێ دەگات یا دێتەبەر. (٣) لەکاتی پیریدا؛ تایبەتی بە دوا قۆناغەکانی ژیان.

**autumnal equinox,** بەرامبەریی شەوو رۆژ لە پاییزدا؛ رۆژگەڕانەوەی پاییز.

**autunite** (ô′tən-īt′), *n.* کانزایەکی زەردە.

**auxiliary** (ôg-zil′yə-ri, ôg-zil′ə-ri), *adj.* (١) یاریدەدەر (مرۆڤ، شت)؛ پاڵپشتکەر. *( an ~ verb)*.
(٢) پاشکۆ؛ لق؛ خوارەدەست؛ ژێردەست. (٣) زیادە: *( ~ troops)*.

*n.* (١) کەسێک یا شتێکی یاریدەدەر.
(٢) *(pl.)* لەشکری وڵاتێکی هاوپەیمان یا بێگانە کە پاڵپشتی هاوپەیمانەکە دەکەن لەکاتی جەنگدا. (٣) لق (ڕێکخراو، کۆمپانیا)؛ پاشکۆ.
(٤) کرداری یاریدەدەر (وشەی داهاتوو ببینە).

**auxiliary verb,** کرداری یاریدەدەر (ڕێزمان).
**( have, has, be, am, may, can, do, shall, will, etc.)**
**( He has been working.; I am playing.;**
**I will see you tomorrow.)**

**Av.,** = **avenue.**

**avail** (ə-vāl′), *v.i. & v.t.* بەکەڵک بوون؛ بەسوودبوون؛ کەڵک هەبوون:
*( Will force alone ~ us?)*

*n.* کەڵک؛ سوود؛ ئەنجام: *( He tried, but to no ~ .)*.

**avail oneself of,** سوود یا کەڵک لێ وەرگرتن (ئامۆژگاری، هەل)؛ بەکارهێنان: *( I would like to avail myself of your advice.)*.

**availability** (ə-vāl′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) دەستکەوتن؛ دەستگیربوون؛ بەئاسانی دەستکەوتن: *( the ~ of electrical supplies)*.
(٢) کەسێک یا شتێکی دەستگیربوو.

**available** (ə-vāl′ə-b′l), *adj.* (١) کەڵک لێ وەرگیراو؛ بەکارهێنراو.
(٢) دەستکەوتوو؛ دەستگیربوو؛ هەیە؛ بەئاسانی دەست دەکەوێت:
*( Everything is ~ in the store.; He was not ~ for comment.)*
(٣) دەستووریە؛ یاسایییە.

**avalanche** (av′ə-lanch′, av′ə-länch′), *n.* (١) کۆمەڵێکی گەورە بەفر، بەرد، یا خۆڵی هەرەس بردوو. (٢) لێشاو:
*( an ~ of words, letters, questions, blows, etc.)*

*v.i. & v.t.* بەسەردا ڕووخان یا هەرەس بردن؛ بەسەردا هاتنەخوارەوە؛ وورووژم بردن.

**avant-garde** (ȧ′vän′gärd′), *n.* پێشڕەو (هونەرمەند)؛ پێشەنگ؛ دەستەی هونەرمەندی پێشڕەو کە شێوازی تازە دادەهێنن.

*adj.* تایبەتی بە دەستەی هونەرمەندە پێشڕەوەکان؛ تایبەتی بە شێوازی تازەی ئەم هونەرمەندانە.

**avarice** (av′ə-ris), *n.* چاوبرسێتی؛ بە هیچ تێرنەخواردن (مەجان)؛ چاوچنۆکی.

**avaricious** (av′ə-rish′əs), *adj.* چاوبرسی؛ چاوچنۆک؛ چاوچنێس؛ بە هیچ تێرنەخۆر.

**avast** (ə-vast′, ə-väst′), *interj.* بوەستە!؛ بەس! (کەشتییەوانی).

**avatar** (av′ə-tär′), *n.* (١) خۆنواندنی خودایەک لەسەر زەوی لەشێوەی مرۆڤدا (ئاینی هیندۆسی). (٢) پیاوی پیرۆز یا زانا (ئاینی هیندۆسی).
(٣) نموونە: *( an ~ of stupidity)*.

**avaunt** (ə-vônt′, ə-vänt′), *interj.* [Archaic]. لاچۆ لەبەرچاوم!؛ بڕۆ!.

**ave** (ä′vi, ä′vā), *interj.* (١) درووودت لێ بێت؛ سڵاوت لێ بێت؛ ڕۆژباش.
(٢) خواحافیز؛ بە نیازی دیدارت.

*n.* (١) درود؛ سڵاو. (٢) [A-] ، درودی مریەم (خاچ پەرستی).
(٣) [A-]. کاتی وتنی ئەم دروودە.

**Ave Maria** (ä′vi mə-rē′ə, ä′vi mə-rī′ə), دروودی خودات لێ بێت ئەی مریەم!.

**avenaceous** (av′i-nā′shəs), *adj.* تایبەتی بە دانەوێڵەیەک کە لە جۆ دەچێت دەڕوێت بە ڕووەکی بەرزە.

**avenge** (ə-venj′), *v.t.* (١) تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵەسەندن؛ تۆڵەسەندنەوە:
*( to ~ a murder, an insult, etc.)*
(٢) تۆڵە بۆ کردنەوە؛ تۆڵە بۆ سەندن؛ تۆڵە بۆ سەندنەوە:
*( to ~ one's sister)*

*v.i.* تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵەسەندنەوە.

-avenger *(n.).*

avenge oneself, تۆڵەی خۆ کردنەوە؛ تۆڵەی خۆ سەندنەوە.

**avenue** (av′ə-nōō′, av′ə-nū′), *n. Abbr.* Av; Ave, (١) شەقام؛ شەقامێکی پان؛ جادە. (٢) (ا) ڕێگەیەک کە لەم بەرو ئەوبەری داروردەخت بێت؛ گوزەر. (ب) ڕێگەیەکی تایبەتی وەها کە بچێت بۆ خانووبەرەیەکی نەختێک دوور لە ڕێگەی گشتییەوە (ئینگلتەرە).
(٣) ڕێباز؛ ڕێگا؛ دەرگا:
*( a new ~ of trade; The best ~ to success is hard work.)*

**aver** (ə-vūr′), *v.t.* (١) سوێند لەسەر خواردن (ڕاستی شتێک)؛ چەسپاندن (ڕاستییەک)؛ یەکلاییکردنەوە.
(٢) بەڵگە بۆ هێنانەوە (دادگەری)؛ سەلماندن.

**average** (av′rij, av′ēr-ij), *n.* (١) تێکڕا (ژمێرە).
(٢) مام ناوەندی؛ ئاسایی:
*( Tom's work at school is above the ~ .)*

*adj.* (١) تێکڕایی؛ تێکڕا:
*( What is the ~ temperature in this town during April?)*
(٢) مام ناوەندی؛ سادە؛ ئاسایی: *( He is of ~ intelligence)*.
(٣) قەبڵێنراو بە تێکڕا (کەشتییەوانی).

*v.i.* بەتێکڕایی ئەوەندەکردن یا ئەوەندەبوون:
*( The children ~ six years of age.)*

*v.t.* (١) تێکڕایی لێکدانەوە یا دەرهێنان.
(٢) ئەوەندەکردن یا بوون بە تێکڕا:
*( He ~s eight hours of work a day.)*
(٣) بەشکردن بەتێکڕایی: *( They ~d the loss among themselves.)*.

average out, [Colloq.], (١) تێکڕایی دەرهێنان یا دۆزینەوە.
(٢) تێکڕابوون لەئەنجامدا.

on the average, بە تێکڕا:
*( He works six hours a day, on the average.)*

**averment** (ə-vūr′mənt), *n.* (١) بەڵگە بۆ هێنانەوە (دادگەری)؛ سەلماندن. (٢) یەکلاییکردنەوە؛ چەسپاندن.
(٣) شتێکی چەسپێنراو یا سەلمێنراو.

**Avernus** (ə-vūr′nəs), *n.* دۆزەخ (ئەفسانەی ڕۆمانی)؛ جەهەننەم.

**averse** (ə-vūrs′), *adj.* (١) ڕق لێ بوو؛ قین لێ بوو؛ حەزلێنەکەر؛ بەدڵ نەبوو: *( to be ~ to hard work)*.
(٢) لە قەدی ڕووەک یا دارەکە دووربوو (ڕووەکناسی).

**aversion** (ə-vūr′zhən, ə-vūr′shən), *n.* (١) ڕق؛ قین؛ نابەدڵی؛ حەز لێ نەکردن: *( She has an ~ to cooking.)*.
(٢) شتێک یا کەسێکی حەزلێنەکراو یا کەس نەویست.

**avert** (ə-vūrt′), *v.t.* (١) ڕووکردن بەولاوە؛ ڕوو لێ وەرگێڕان:
*( He ~s his glance from ugly things.)*
(٢) خۆ لێ لادان؛ نەهێڵان؛ خۆ لێ دوورگرتن:
*( to ~ trouble, failure, an accident, etc.)*

**Aves** (ā′vēz), *n.pl.* باڵندە (گیانەوەرناسی)؛ توخمی باڵندە.

**Avesta** (ə-ves′tə), *n.* ئاڤێستا: پەرتووکی پیرۆزی زەردەشتەکان.

**Avestan** (ə-ves′tən), *adj.* (١) ئاڤێستایی.
(٢) تایبەتی بە زمانی ئاڤێستایی.

*n.* زمانی ئاڤێستایی (کە کۆنترین زمانی هیندۆ-ئەورووپییە).

**avian** (ā′vi-ən), *adj.* تایبەتی بە باڵندە یا مەل؛ باڵندەیی.

**aviary** (ā′vi-er′i), *n.* قەفەزێکی گەورەی باڵندە.

**aviate** (ā′vi-āt′, av′i-āt′), *v.t.* فڕۆکەلێخوڕین؛ فڕۆکەوانی کردن.

**aviation** (ā′vi-ā′shən, av′i-ā′shən), *n.* (١) زانستی فڕین؛ فڕین؛

فڕۆکەلێخوڕین. (۲) فڕۆکە دروستکردن. (۳) فڕۆکەی سەربازی.

**aviator** (ā′vi-ā′tẽr, av′i-ā′tẽr), ***n.*** فڕۆکەچی؛ فڕۆکەوان.

**aviatrix** (ā′vi-ā′triks, av′i-ā′triks), ***n.*** فڕۆکەوانی ژن

**avid** (av′id), ***adj.*** (۱) (أ) ( ~ of; ~ for )، برسی (مەجان)؛ بەپەرۆش:
***( ~ for adventure)***

(ب) چاوبرسی؛ چاوچنۆک؛ چاوتێرنەخۆر.

(۲) بەپەرۆش؛ بەشەوق؛ بەجۆش؛ زۆر حەزلێکەر:

***( an ~ sportsman, reader, supporter, etc.)***

**-avidly** ***(adv.).***

**avidity** (ə-vid′ə-ti), ***n.*** (۱) (أ) چاوبرسێتی؛ بە هیچ تێرنەبوون؛ چاوچنۆکی. (ب) برسێتی (مەجان). (ج) پەرۆشی؛ جۆش‌وخرۆشی.

(۲) [Rare]، تینی ترشەڵۆک (کیمیا).

**avifauna** (ā′vi-fô′nə), ***n.*** هەموو باڵندەی ناوچەیەك

**avionics** (ā′vi-ō′niks), ***n.*** زانست یا تەکنۆلۆجیای فڕین‌و ئامێری ئەلەکترۆنی فڕین.

**-avionic** ***(adj.).***

**avirulent** (ā-vir′yoo-lənt, ā-vir′oo-lənt), ***adj.*** بێ هێزو لاوازو بێ توانایی نەخۆشی تووش کردن (میکرۆب).

**avitaminosis** (ā-vīt′ə-min-ō′sis), ***n.*** نەخۆشییەکە هۆی کەمیی ڤیتامینە لە خواردەمەنیدا.

**avocado** (av′ə-kä′dō, ä′və-kä′dō), ***n.*** (۱) ئاڤۆکادۆ: میوەیەکی ترۆپیکی ئەمەریکایی پێست گرنج گرنجە ئەوەندەی هەرمێ‌یەکە ناوکێکی گەورەی هەیە. (۲) داری ئەم میوەیە.

**avocation** (av′ə-kā′shən), ***n.*** (۱) خولیا؛ شتێکە کەسێك دەیکات بۆ ڕابواردن نەك بۆ پارە. (۲) [Archaic]، پیشە.

**avocet** (av′ə-set′), ***n.*** باڵندەیەکی ئاوی لاق درێژی قاچ تەنراوە دەنووکێکی باریك‌و درێژی هەیە سەرەکەی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ سەرەوە.

**avoid** (ə-void′), ***v.t.*** (۱) بەتاڵ کردنەوە (دادگەری)؛ سڕینەوە.

(۲) خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ دوورخستنەوە؛ خۆ لێ پاراستن؛ خۆ لێ تەریك گرتن؛ لێ ڕاکردن؛ سڵ لێکردنەوە؛ لێ تەکینەوە؛ دوورکەوتنەوە:

***( to ~ trouble, embarrassment, responsibility, a person, an accident, etc.)***

**avoidable** (ə-void′ə-b'l), ***adj.*** بەتاڵ دەکرێتەوە؛ خۆی لێ لادەدرێت؛ خۆی لێ دەپارێزرێت.

**avoidance** (ə-void′əns), ***n.*** (۱) خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ پاراستن؛ خۆ لێ دوورگرتن. (۲) بەتاڵ کردنەوە (دادگەری)؛ سڕینەوە.

**avoirdupois** (av′ẽr-də-poiz′), ***n.*** (۱) پەیرەوێکی ئینگلیزی‌و ئەمەریکییە (پاوەنێك بە شانزە " ئاونس " دادەنێت).

(۲) [Colloq.]، قورسی (مرۆڤ).

**avoirdupois weight,** پەیرەوی کێشانی ئینگلیزی‌و ئەمەریکییە (شانزە ئاونس " دەکاتە " پاوەنێك‌و دووهەزار پاوەن دەکاتە تەنێك).

**avouch** (ə-vouch′), ***v.t.*** (۱) شایەتی بۆ دان (سەرڕاستی، باشی، توانا)؛ گەرەنتی دان؛ کەفالەت کردن. (۲) یەکلاکردنەوە؛ ووتن بەبێ دوودڵی.

(۳) دان پیانان بەئاشکرا؛ پێ لێنان.

**avow** (ə-vou′), ***v.t.*** (۱) دان پیانان؛ پێ لێنان؛ ووتن.

(۲) ئاشکراکردن؛ بڵاوکردنەوە؛ دان پیانان بەئاشکرا؛ خۆ ئاشکراکردن:

***( He ~ed himself a socialist.)***

**avowal** (ə-vou′əl), ***n.*** دان پیانانێکی ئاشکرا؛ پێ لێنان

**avowed** (ə-voud′), ***adj.*** بەئاشکرا دان پیانەر؛ خۆئاشکراکەر؛ ناسراو ***( an ~ Marxist, rebel, enemy, etc.)*** .

**-avowedly** ***(adv.).***

**avulsion** (ə-vul′shən), ***n.*** (۱) بەزۆر لێکردنەوە؛ لێ دابڕین؛ پچڕاندن؛ بەزۆر لەیەك جیاکردنەوە؛ هەڵپرووسکاندن. (۲) پارچەیەکی بەزۆر لێکراوە یا پچڕێنراو. (۳) (أ) لێ دابڕانی کوتوپڕی پەڵەیەك زەوی لە زەوی‌وزاری کەسێك‌و چوونەسەر زەوی‌وزاری کەسێکی تر، بەڵام مانەوەی لە دەست خاوەنی یەکەمیدا (بەهۆی گۆڕینی ڕێبازی جۆگە). (ب) ڕامالینی زەوی کەسێك بە باوباران‌و بوونی بە بەشێك لە زەوییەکی تر.

**avuncular** (ə-vuŋ′kyoo-lẽr), ***adj.*** تایبەتی بە مام یا خاڵ؛ مامانە؛ خاڵانە.

**await** (ə-wāt′), ***v.t.*** (۱) چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕوان کردن؛ بەتەمابوون:
***( to ~ a reply, answer, etc.)***

(۲) بۆ ئامادەبوون؛ چاوەڕوان بوون؛ لە ڕێگەدا بوون:

***( Death ~s the strongest man.; A hearty welcome ~s you.)***

**awake** (ə-wāk′), ***v.t.*** (۱) لە خەو هەڵساندن؛ هەڵساندن؛ خەبەرکردنەوە.

(۲) ووریاکردنەوە؛ ڕاپەڕاندن.

(۳) هێنانەوەبیر (ترس، بیرەوەری)؛ زیندووکردنەوە (مەجان).

***v.i.*** (۱) لە خەو هەڵسان؛ خەبەربوونەوە؛ هەڵسان.

(۲) هۆشیاربوونەوە؛ سەربەرزکردنەوە؛ بزووان.

***adj.*** (۱) لە خەو هەڵساو؛ بەخەبەر؛ هەڵساو. (۲) زیت؛ ووریا؛ قیت.

awake to, (۱) ئاگادارکردن؛ بیرخستنەوە؛ پێ زانین.

(۲) ئاگا لێ بوون؛ ئاگادار؛ بەئاگا.

**awaken** (ə-wāk′ən), ***v.t.*** (۱) لە خەو هەڵساندن؛ خەبەرکردنەوە.

(۲) ڕاپەڕاندن؛ ووریاکردنەوە؛ ئاگادارکردنەوە؛ بزواندن.

***v.i.*** لە خەو هەڵسان؛ هەڵسان؛ خەبەربوونەوە.

**awakening** (ə-wāk′ən-iŋ), ***n.*** (۱) لە خەو هەڵسان؛ خەبەربوونەوە؛ هەڵسان. (۲) بزووتنەوە (هەستی ئاینی، نەتەوایەتی... هتد)؛ ووریابوونەوە

***adj.*** (۱) لە خەو هەڵساو؛ بەخەبەر.

(۲) لە خەو هەڵسێن؛ خەبەرکەرەوە؛ ووریاکەرەوە؛ بزوێن.

**award** (ə-wôrd′), ***v.t.*** (۱) پێدان (دادگەری)؛ بۆ بڕینەوە (بڕاردن):
***( The plaintiff was ~ed his damages.)***

(۲) خەڵات کردن؛ پێدان (خەڵات)؛ پێ بەخشین:

***( We ~ a prize for the best essay.)***

***n.*** (۱) بڕیار (دادگا). (۲) خەڵات؛ بەخشیش؛ پاداشت.

**aware** (ə-wâr′), ***adj.*** ئاگادار؛ بەئاگا؛ ووریا؛ شارەزا؛ بزان؛ چاوکراوە. (گەڵێك جار " of " ی لەگەڵدایە " aware of " ):

***( ~ of the situation; ~ of their limitations; He is ~ .)***

**awareness** (ə-wâr′nis), ***n.*** ئاگا؛ هۆش؛ هۆشیاری؛ زانین؛ شارەزایی.

**awash** (ə-wäsh′, ə-wôsh′), ***adv. & adj.*** (۱) ئاو داپۆشیوە؛ ئاوی لێ هەڵنیشتووە؛ نوقوم بووە لە ئاودا. (۲) ئاو ڕای ماڵیوە؛ ئاوبردوو.

(۳) سەرئاوکەوتوو.

**away** (ə-wā′), ***adv.*** (۱) دوور لە؛ بۆ دوور: ***( He ran ~ .)*** .

(۲) زۆر (لە دواوە): ***( ~ behind)*** .

(۳) بەلادا: ***( The land dropped ~ .)*** .

(٤) بەولاوە؛ بەولادا: ***( Turn your eyes ~ .)*** .

(٥) پێدان؛ ئاشکراکردن: ***( Don't give ~ the secret.)*** .

(٦) نەمان: ***( The sound faded ~ .)*** .

(٧) یەکسەر؛ هەر ئێستا: ***( Fire ~ .)*** .

(٨) بەبێ وەستان؛ بێ ووچان: ***( He worked ~ all night.)*** .

***adj.*** (۱) نادیار؛ لێرە نییە؛ ڕۆیشتووە: ***( He is ~ .)*** .

(۲) دوور؛ لە (ئەوەندە) دوورەوە: ***( a mile ~ .)*** .

***interj.*** (۱) لاچۆ لەبەرچاوم؛ بڕۆ. (۲) با بڕۆین.

away with, (۱) بردن؛ لابردن.

(۲) بڕۆ؛ لاچۆ؛ لاچۆ لەبەرچاوم: ***( Away with you!)*** .

do away with, (۱) لابردن؛ نەهێشتن؛ دوایی پێ هێنان:

***( to do away with unnecessary formalities.)***

(۲) کوشتن؛ سەر بە گۆڕدا کردن.

give away, بەخشین؛ بە دیاری دان؛ بە خۆڕایی دان.

**awe** (ô), ***n.*** (۱) سام؛ ترس؛ سام‌و ترس‌و ڕێز (بۆ کەسێك یا شتێك)؛ شکۆ: ***( We stood in ~ of him.)*** .

(۲) [Obs.]، ترسێکی زۆر.
*v.t.* سام لێ نیشتن؛ ترسان.
**stand (or be) in awe of,** سام لە دڵدا بوون بۆ؛ سام لێ نیشتن.
**aweather** (ə-weth′ẽr), *adv. & adj.* بەرەو با؛ ڕووەو با.
**aweigh** (ə-wā′), *adj.* لە بنی ئاو یا لە زەوی نەکەوتووە (لەنگەر).
**aweless** (ô′lis), *adj.* بێ سام؛ بێ ترس؛ بێ شکۆ.
**awesome** (ô′səm), *adj.* (۱) بەسام؛ سامناك؛ بەشکۆ: *( an ~ sight)*
(۲) سام لێ نیشتوو؛ ترس لێ نیشتوو.
**awe-stricken** (ô′strik′n), *adj.* سام لێ نیشتوو.
**awe-struck** (ô′struk′), *adj.* سام لێ نیشتوو.
**awful** (ô′fool), *adj.* (۱) بەسام؛ سامناك؛ سامدار.
(۲) تۆقێنەر؛ جەرگبڕ؛ زراوبەر.
(۳) [Colloq.]، (أ) خراپ؛ ناپەسەند: *( an ~ joke; an ~ manners)* .
(ب) زۆر؛ نێجگار *( an ~ bore)* .
**awfully** (ô′fool-i), *adv.* (۱) بەسامەوە؛ سامناکانە؛ بەترسەوە.
(۲) [Colloq.]، زۆر؛ نێجگار زۆر: *( ~ late; an ~ pretty dress; an ~ nice person)*
**awhile** (ə-hwīl′), *adv.* تاوێك؛ بۆ تاوێك؛ بۆ ماوەیەکی کەم.
**awkward** (ôk′wẽrd), *adj.* (۱) گەلحۆ؛ گێل؛ ناقۆلا؛ حۆل؛ نالەبار؛ ناکارامە *( an ~ person)*
(۲) قەبە؛ ناقۆلا؛ بەئاسانی بەکارناهێنرێت: *( an ~ tool)* .
(۳) ناخۆش؛ نارەحەت: *( an ~ position)* .
(٤) نابەجێ؛ ناپەسەند؛ لە جێی خۆیدا نییە؛ ناشرین؛ خراپ: *( an ~ remark)*
(٥) مایەی تەریق بوونەوەیە: *( an ~ situation)* .
**-awkwardly** *(adv.)*; **awkwardness** *(n.)*.
**awkward age,** هەرزەکاری؛ تەمەنی هەرزەکاری؛ هەرزەیی.
**awl** (ôl), *n.* درەوشە؛ درەوش.
**awless** (ô′lis), *adj.* = **aweless.**
**awn** (ôn), *n.* قەڵاس؛ پڕژی گەنمو جۆو جۆداس.
**awning** (ôn′iŋ), *n.* چەتری سەر دەرگاو پەنجەرە.
**awoke** (ə-wōk′), *past tense and p.p. of* **awake.**
**awoken** (ə-wōk′ən), *obsolete p.p. of* **awake.**
**awry** (ə-rī′), *adv. & adj.* (۱) لار؛ خوار؛ چەوت.
(۲) بەهەڵەداچوو؛ هەڵە؛ تێکچوو؛ شێواو؛ سەرنەگرتوو؛ ژێرکەوتوو: *( Our plans went ~ .)*
**ax, axe** (aks), *n.* تەور.
*v.t.* بە تەور داپاچین؛ بە تەور بڕینەوە.
**get the ax,** (۱) [Colloq.]، سەربڕان (مرۆڤ).
(۲) [Slang]، لە ئیش دەرکران؛ لەکارخران.
**have an ax to grind,** [Colloq.], مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە بۆیە ئەوەندە گوێ بە مەسەلەکە دەدات؛ داخ لە دڵ
**axes** (ak′sēz), *n. plural of* **axis.**
**axes** (ak′siz), *n. plural of* **ax.**
**axial** (ak′si-əl), *adj.* (۱) تەوەرەیی؛ وەك تەوەرە.
(۲) وەك تەوەرە لێهاتوو. (۳) بەدەور یا تەنیشتی تەوەرەدا.
**axil** (ak′sil), *n.* گۆشەی نێوان گەڵاو لقەکەی یا لق و ئەو قەدەی کە لێی جیابووەتەوە.
**axilla** (ak-sil′ə), *n.* (۱) بن باڵ؛ بن باخەڵ؛ بن قۆڵ. (۲) **axil** .
**axillar** (ak′sə-lẽr), *adj.* = **axillary.**
*n.* پەڕی بن باڵی باڵندە.
**axillary** (ak′sə-ler′i), *adj.* (۱) تایبەتی بە بن باڵ یا بن قۆڵ.
(۲) تایبەتی بە گۆشەی نێوان گەڵاو لقەکەی یا لقێك و ئەو قەدەی کە لێی جیابووەتەوە.

*n.* = **axillar.**
**axiology** (ak′si-ol′ə-ji), *n.* زانستی بنچینەی بایەخ و بایەخ پێدان و هەڵسەنگاندن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاینی و جوانی ناسی و ڕەووشتدا (فەلسەفە).
**axiom** (ak′si-əm), *n.* (۱) ڕاستییەکی بەڵگەنەویست؛ وتەیەکی بەڵگەنەویست. (۲) بەڵگەنەویست (بیرکاری)
(۳) دەستوور یا ڕێڕەوێکی گشتی و چەسپاو؛ ڕاستییەکی پەسەندکراو.
(٤) درووشم. (٥) قسەی نەستەق.
**axiomatic** (ak′si-ə-mat′ik), *adj.* (۱) بەڵگەنەویست؛ تایبەتی بە ڕاستییەکی بەڵگەنەویست؛ دیار: *( It is ~ that a whole is greater than any of its parts.)*
(۲) پڕە لە قسەی نەستەق؛ پڕە لە ڕاستی بەڵگەنەویست.
**-axiomatically** *(adv.)*.
**axis** (ak′sis), *n.* (۱) تەوەرە؛ تەوەر: *( the ~ of a planet)* .
(۲) پەیمان (نێوان وولاتان). (۳) [A-]، پەیمانی نێوان ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو لەدوایی‌دا یابان لە جەنگی جیهانیی دووەمدا.
(٤) (أ) بڕبڕەی دووەمی مل. (ب) بڕبڕەی پشت. (٥) قەد (درەخت، ڕووەك).
**the Axis,** پەیمانی نێوان ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو یابان لە جەنگی جیهانیی دووەمدا.
**axle** (ak′s′l), *n.* (۱) تەوەر؛ تەوەرە؛ ستوونێکە ڕەوڕەوەی ئوتومبیل یا عەرەبانە بەیەك دەگەیەنێت و لەسەری دەخوولێنەوە؛ ئەکسل.
(۲) **axletree** .
**axletree** (ak′s′l-trē′), *n.* ئەکسل؛ تەوەرەیەکە ڕەوڕەوەی ئوتومبیل بەیەك دەگەیەنێت و لەسەری دەخوولێنەوە.
**axman** (aks′mən), *n.* دارکەر.
**axolotl** (ak′sə-lot′l), *n.* گیاندارێکە لە قوڕی دەچێت (گۆشتەکەی دەخورێت).
**ay** (ā), *adv.* [Archaic], هەمیشە.
**ay, aye** (ī), *adv. & n.* بەڵێ؛ ئا.
**ay** (ā), *interj.* ئای؛ ئاخ؛ ئاە.
**aye** (ī), *adv.* بەڵێ؛ ئا.
*n.* بەڵێ (دەنگدان)؛ دەنگی پەسەندکردن (دەنگدان): *( The ~s have it.)*
**aye-aye** (ī′ī′), *n.* گیاندارێکە لە توخمی مەیموونە.
**azalea** (ə-zāl′yə), *n.* ئەزێلیا؛ گوڵە ئەزێلیا.
**azimuth** (az′ə-məth), *n.* کەوانەی نێوان لووتکەو ئاسۆ (ئاسمان-ناسی)؛ سەمت.
**azo** (az′ō, ā′zō), *adj.* نایترۆجینی تێدایە (کیمیا).
**azo-** (az′ō, ā′zō), پێشگرێکە بەمانای: نایترۆجین.
**azoic** (ə-zō′ik), *adj.* (۱) ژیانی تێدا نابێت؛ بێ ژیان.
(۲) [A-]، تایبەتی بە چەرخی پێش دەستپێکردنی ژیان (زەمینزانی).
**azonic** (ā-zon′ik), *adj.* تایبەتی نییە بە ناوچەیەك بەڵکو بە هەموو ناوچەیەك؛ هی یەك ناوچە نییە.
**azote** (az′ōt, ə-zōt′), *n.* ئازۆت؛ نایترۆجین.
**azoth** (az′oth), *n.* جیوە (کیمیا).
**azotize** (az′ə-tīz′), *v.t.* نایترۆجین تێکەڵاوکردن؛ نایترۆجین لێدان؛ نایترۆجین تێکردن.
**Azrael** (az′ri-əl), *n.* ئیزرائیل: فریشتەی گیان کێشان.
**Aztec** (az′tek), *n.* (۱) ئازتێك؛ ئازتێکی؛ ئازتێکییەك (ئازتێك گەلێکی پێشکەوتوو بوون فەرمانڕەوایی مەکسیکیان دەکرد هەتا ئیسپانییەکان داگیریان کرد لە ساڵی ١٥١٩ دا). (۲) زمانی ئازتێکی.
*adj.* ئازتێکی (گەل، زمان، کلتوور... هتد).
**-Aztecan** *(adj.)*.
**azure** (azh′ẽr, ā′zhẽr), *adj.* شین؛ شینی ئاسمانی؛ وەك سایەقەی ساماڵ.

*n.* (١) شینی ئاسمانی؛ شین. (٢) [Poetic] ، ئاسمانی شین.

**azurite** (azh′ə-rīt′), *n.* بەردێکی بەنرخی شینە.

**azygous** (az′i-gəs), *adj.* تاک (زیندەوەرزانی)؛ تەنها؛ ئەندامی تاک.

# B b

**B, b** (bē), *n.* (١) تیپی دووەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە " بێی "
*adj.* دووەم؛ پلە. پێن.
**B** (bē), *n.* (١) شتێك كە لە تیپی " B " بكات. (٢) دووەم (كەس، شت).
(٣) ژمارە (٢٠٠)ی ڕۆمانی.
(٤) (ا) نمرەیەكی قوتابییە كە " باش " دەگەیەنێت:
*( He has a "B" in history.)*
(ب) قوتابییەك كە ئەم نمرەیە وەردەگرێت.
(٥) نۆتەی مۆسیقا
*adj.* مام ناوەندی؛ نارنجی.
**B.A.; A.B., = Bachelor of Arts.,** بڕوانامەی بەكالۆریۆسی هونەرو ئەدەبیات (كە زانستە مرۆڤایەتییەكان دەگرێتەوە).
**baa** (bä), *n.* باعەباع (مەڕ، بزن، كارو بەرخ).
*v.i.* باعەباع كردن.
**Baal** (bā'əl, bāl), *n.* (١) باڵ خودای ڕۆژ یا ئاژەڵو پیت لەلای كەنعانیو فینیقییەكان. (٢) بت
**babbitt** (bab'it), *n.* بابت. جۆرە كانزایەكە
**babbitt, Babbitt** (bab'it), *n.* بابت. پیشەسازێكی مێشك تەسكی تێنەگەیشتووی خۆپەرستی چاوبرسی؛ هەركەسێكی وەها.
**babbittry, Babbittry** (bab'it-ri), *n.* چاوبرسێتیو مێشك- تەسكیو نەخوێندەواریو خۆپەرستیو گوێ نەدان بە هونەرو ڕۆشنبیری.
**babble** (bab''l), *v.i.* (١) گڕوگاڵ كردن
(٢) زۆر ووتن؛ قسەی هیچوپووچو منداڵانە كردن: *( She always ~s.)* .
(٣) خوڕەخوڕهاتن (ئاو).
*v.t.* (١) قسەی هەلەقومەلەق كردن؛ زۆر ووتن. (٢) نهێنی دركاندن.
*n.* (١) گڕوگاڵ. (٢) قسەی بێ تامو هیچوپووچ؛ دەم بەیەكدادان.
(٣) خوڕەخوڕی ئاو.
**babe** (bāb), *n.* (١) منداڵی ساوا یا كۆرپە؛ منداڵ.
(٢) كەسێكی ساویلكە؛ كەسێكی بێ دەسەڵاتو لێنەهاتوو.
(٣) [Slang]، كچ؛ كچێكی جوان؛ بەرخ.
**Babel** (bā'b'l, bab''l), *n.* (١) بابل؛ شاری بابل.
(٢) خانوو یا بورجێكی زۆر بەرز. (٣) پیلانێكی نەكردەنی.
(٤) [b-]، (ا) گەرەلاوژێ. (ب) گەرەلاوژێ خانە.
**babirusa** (bab'i-rōō'sə, bä'bi-rōō'sə), *n.* بەرازی هیندی (كە- دوو شفرەی هەیە وەك شاخ بە پشتدا چەمیونەتەوە)؛ یەكانەی هیندی.

**baboon** (ba-bōōn', bə-bōōn'), *n.* (١) بابوون: جۆرە مەیموونێكی گەورەی ئەفریقاییە سەری زلو كلكی كورتە لووتو ددانی لە هی سەگ دەچێت. (٢) [Slang]، كەسێكی لە مەیموون چوو؛ كەسێكی ناشرین یا كێویو كەرتڕو نەزان؛ سەگسار.
**baboonery** (ba-bōōn'ēr-i, bə-bōōn'ēr-i), *n.* ڕەووشتو- كردەوەی مەیموونانە.
**babu, baboo** (bä'bōō), *n.* (١) نازناوێكی هیندییە وەك " بەگ " ، " ئەفەندی " یا " جەناب " . (٢) هیندییەك كە نەختێك خوێندەواری ئینگلیزی هەبێت (لەڕووی سووكییەوە). (٣) میرزا یا نووسەرێكی فەرمانگەی هیندی كە نەختێك ئینگلیزی بزانێت
**babushka** (bə-boosh'kə), *n.* سەرپۆش.
**baby** (bā'bi), *n.* (١) منداڵی شیرەخۆرە؛ منداڵی ساوا یا كۆرپە؛ منداڵ.
(٢) كەسێك كە ڕەووشتو كردەوەی منداڵانە دەنوێنێت؛ كەسێكی دەستەپاچە. ترسنۆك، یا هیچ لێنەهاتوو. (٣) گەنجترین یا بچووكترین ئەندامی كۆمەڵێك.
(٤) [Slang]، كچ؛ كچ یا ژنێكی گەنجو جوان؛ بەرخ.
*adj.* (١) هی منداڵی كۆرپە یا ساوا؛ هی منداڵ: *( a ~ carriage)* .
(٢) منداڵانە؛ زۆر گەنج: *( a ~ face)* .
(٣) بچووك؛ بچكۆلە. (٤) منداڵانە (ڕەووشت، كردەوە).
*v.t.* نازكێشان؛ بەدەمەوەدان؛ دڵنەوایی زۆر كردن؛ لاواندنەوە:
*( to ~ someone; Don't ~ him too much.)*
**baby buggy,** عەرەبانەی منداڵ.
**baby farm,** شوێنی بەخێوكردنی منداڵ بە كرێ (لەڕووی سووكییەوە).
**babyhood** (bā'bi-hood'), *n.* (١) كۆرپایەتی؛ كاتی كۆرپایەتی؛ ساوایەتی. (٢) كۆرپەكان؛ كۆرپە.
**babyish** (bā'bi-ish), *adj.* (١) لە كۆرپە دەچێت؛ لە منداڵی ساوا دەچێت. (٢) ترسنۆكو منداڵانە.
**Babylon** (bab''l-ən, bab'i-lon'), *n.* (١) شاری بابل؛ بابل.
(٢) شارێكی گەورە كە بە كەیفو ڕابواردنو خۆش گوزەرانیو خراپە ناسرابێت.
**Babylonia** (bab''l-ō'ni-ə), *n.* ئیمپراتۆریەتی بابل.
**Babylonian** (bab''l-ō'ni-ən), *adj.* (١) بابلی؛ هی بابلییەكان.
(٢) تایبەتی بە ئیمپراتۆرییەتی بابلی. (٣) بەد؛ بەدخواز؛ بەدكار.
*n.* (١) بابلی؛ كەسێكی بابلی. (٢) بابلی؛ زمانی بابلی.
**baby-sit** (bā'bi-sit'), *v.i.* منداڵ ژێركردن؛ لەلەیی كردنی منداڵ؛ ئێشكگرتنی منداڵ.
**baby sitter,** لەلە؛ لەلەی منداڵ؛ منداڵ ژێركەر؛ ئێشكگری منداڵ.
**baccalaureate** (bak'ə-lô'ri-it), *n.* (١) بڕوانامەی بەكالۆریۆس (هی زانست یا ئەدەبیات). (٢) ووتاری خواحافیزی (لە ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیانی زانكۆدا).
**baccate** (bak'āt), *adj.* (١) لە تووترك، شاتوو، یا شلیك دەچێت.
(٢) تووترك، شاتوو، یا شلیك دەگرێت.
**Bacchae** (bak'ē), *n.pl.* (١) دۆستە ئافرەتەكانی " باكۆس " خودای مەیو مەی خواردنەوە (ئەفسانەی یۆنانیو ڕۆمانی). (٢) ئافرەتە " باكۆس " پەرستەكان (ئەفسانەی یۆنانیو ڕۆمانی).
**Bacchanal** (bak'ə-n'l, bak'ə-nal'), *n.* (١) " باكۆس " پەرست.
(٢) مەی خۆر؛ هەمیشە سەرخۆش؛ مەست.
(٣) ئاهەنگو زەماوەند (بەتایبەتی هی مەی خواردنەوەو ڕابواردن).
(٤) سەمایەك كە بۆ " باكۆس " بكرێت؛ گۆرانییەك كە بە " باكۆس " دا هەڵدرابێت.
*adj.* (١) تایبەتی بە " باكۆس " و پەرستنی. (٢) خواردنەوە (مەی).
**Bacchanalia** (bak'ə-nā'li-ə, bak'ə-nāl'yə), *n.pl.* (١) - ئاهەنگێكی ڕۆمانی كۆنە بە یادی " باكۆس " ەوە دەگێڕرا.
(٢) [b-]، ئاهەنگێكی مەی خواردنەوەو بەرەڵایی.
**Bacchanalian** (bak'ə-nā'li-ən, bak'ə-nāl'yən), *adj.* (١) - هی " باكۆس " پەرستەكان؛ هی ئاهەنگی " باكۆس " .
(٢) سەرخۆشو بەلەسەبوو؛ بەرەڵا؛ تایبەتی بە كەیفو ڕابواردن.

*n.* کەسێکی مەست؛ شەیدا؛ سەرخۆش.

**bacchant** (bak′ənt), *n.* (١) " باکۆس " پەرستێك.
(٢) سەرخۆشێکی بەرەڵا
*adj.* (١) " باکۆس " پەرست. (٢) مەی خۆر.

**bacchante** (bə-kan′ti, bə-kant′, bak′ənt), *n.* (١) ئافرەتی - " باکۆس " پەرست. (٢) ئافرەتی مەی خۆر.

**bacchantic** (bə-kan′tik), *adj.* تایبەتی بە " باکۆس " پەرستان و مەی خۆران

**Bacchic** (bak′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە " باکۆس " و پەرستنی.
(٢) [b-]. سەرخۆش؛ بەرەڵا؛ ئاهەنگی.

**Bacchus** (bak′əs), *n.* باکۆس: خودای مەی و کەیف و ڕابواردن (ئەفسانەی یۆنانی و ڕۆمانی).

**bacciferous** (bak-sif′ēr-əs), *adj.* تووترك، شاتوو، یا شلیك دەگرێت.

**bacciform** (bak′si-fôrm′), *adj.* لە تووترك، شاتوو، یا شلیك دەچێت

**bach** (bach), *v.i.* [Slang], بە زوگورتێتی ژیان؛ بە تەنها ژیان.

**bachelor** (bach′ə-lēr, bach′lēr), *n.* (١) سوارچاکێکی گەنج کە لەژێر سایەی سوارچاکێکی گەورەو ناوداردا کاری دەکرد.
(٢) هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆس. (٣) ڕەبەن؛ زوگورتی؛ کوڕ.

**bachelor-at-arms** (bach′ə-lēr-ət-ärmz′), *n.* (ژمارە یەکی ووشەی پێشوو ببینە).

**bachelor girl,** [Colloq.], ئافرەتی شوونەکردوو؛ ئافرەتی زوگورتی؛ کچ.

**bachelorhood** (bach′ə-lēr-hood′, bach′lēr-hood′), *n.* ڕەبەنی؛ زوگورتێتی.

**Bachelor of Arts,** (١) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی ئەدەبیات.
(٢) وەرگر یا هەڵگری ئەم بڕوانامەیە.

**Bachelor of Science,** (١) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی زانیاری؛ بەکالۆریۆسی زانست. (٢) وەرگر یا هەڵگری ئەم بڕوانامەیە.

**bachelor's-button** (bach′ə-lērz-but′n, bach′lērz-but′-′n), *n.* ڕووەکێکە گوڵەکەی لە قۆپچە دەچێت.

**bachelorship** (bach′ə-lēr-ship′, bach′lēr-ship′), *n.* = **bachelorhood.**

**bacillar** (bə-sil′ēr, bas′′l-ēr), *adj.* (١) لە شیش یا داردەست دەچێت (میکرۆب) (٢) تایبەتی بە میکرۆبی " باسیل " کە لە داردەست یا چیلکە دەچێت.

**bacillary** (bas′′l-er′i, bə-sil′ēr-i), *adj.* = bacillar.

**bacillus** (bə-sil′əs), *n.* (*pl.* **bacilli**), (١) باسیل: بەکتریایەکە لە شیش یا داردەست دەچێت و زنجیرە دەبەستێت.
(٢) (*pl.*). هەر بەکتریایەك کە نەخۆشی تووش بکات.

**back** (bak), *n.* (١) پشت (لەش).
(٢) بڕبڕەی پشت؛ بڕبڕاگە یا مووڕەغەی پشت.
(٣) پشت (کورسی): *( the ~ of a chair)* .
(٤) پشتەوە (جل وبەرگ، زین). (٥) هێز؛ توانا.
(٦) پشتەوەی شت. (٧) ئەودیو.
(٨) دیوی بەکارنەهێنراوی شت؛ پشت: *( the ~ of the hand)* .
(٩) دیوی ناوەوەی قوماش. (١٠) بەرگی پەرتووك؛ پشت (پەرتووك، پەڕاو).
(١١) یاریکەری دوای ڕیزی پێشەوە (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
*adj.* (١) پشتەوە؛ دواوە؛ هی پشتەوە: *( a ~ door)* . (٢) دوور.
(٣) (ا) هی ڕابوردوو نەدراو (مووچە، کرێ): *( ~ pay)* .
(ب) هی پێشوو یا ڕابوردوو: *( the ~ issues of a magazine)* .
(٤) بۆ دواوە (مەلە) *( a ~ stroke)* .
(٥) لە بەشی دواوەی دەمدا دەبێژرێت (دەنگزانی).
*adv.* (١) لەدواوە؛ لەپشتەوە؛ بەرەودوا. (٢) بەرەو شوێنی پێشوو.
(٣) بەرەو دۆخی جاران؛ بەرەو باری پێشوو. (٤) بەرەو کاتی ڕابوردوو.
(٥) بەدەستەوەنەدان؛ شاردنەوە؛ پێ نەدان: *( to hold ~ information)* .
(٦) تۆڵەکردنەوە؛ هەق کردنەوە: *( to pay one ~ )* .
(٧) دانەوە (قەرز): *( to pay ~ a loan, debt, etc.)* .
*v.t.* (١) ( ~ **up** )، گەڕاندنەوە بۆ دواوە: *( to ~ up a car)* .
(٢) ( ~ **up** )، پاڵپشتی کردن؛ لایەنگری کردن؛ پشتیوانی کردن: *( to ~ up someone in a fight, project, etc.)*
(٣) سواربوون.
(٤) گرەو لەسەرکردن: *( to ~ a horse in a race)* .
(٥) پشت بۆ دروستکردن. (٦) پشت ئیمزاکردن (چەك).
(٧) وەك پشت وابوون بۆ.
*v.i.* (١) ( ~ **up** )، گەڕانەوە بۆ دواوە: *( The car was ~ing up when it hit her.)*
(٢) وەرگەڕانەوە (با).

**back and forth,** (١) چوون و هاتن. (٢) لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر.

**back down,** [Colloq.], دەست هەڵگرتن لە داوایەك؛ وازهێنان؛ چاوشکان؛ پاشگەزبوونەوە؛ کشانەوە.

**back off,** [Colloq.], خۆکشانەوە (پەیمان)؛ پەیمان شکاندن؛ پاشگەزبوونەوە؛ پەشیمان بوونەوە.

**back out,** [Colloq.], خۆکشانەوە (پەیمان)؛ پەیمان شکاندن.

**back up,** پشتگیری کردن؛ لایەنگری کردن.

**be (flat) on one's back,** لەناو جێگەدا کەوتن؛ نەخۆش بوون و لەناو جێگەدا مانەوە؛ پەککەوتن.

**behind one's back,** لەپاش ملە؛ بە دزی کەسەکە خۆیەوە: *( You shouldn't talk about people behind their back.)*

**break one's back,** پشت شکاندن (بە ئیش پێکردنی زۆر یا بە شەڕ).

**get off one's back,** لەکۆڵ بوونەوە؛ ئیتر وازلێهێنان؛ بەرۆك بەردان: *( Please, get off his back.)*

**go back on,** [Colloq.], (١) خۆکشانەوە (پەیمان)؛ پەیمان شکاندن.
(٢) ناپاکی لەگەڵ کردن؛ پشت بەردان.

**turn one's back on,** (١) پشت تێکردن (لە ڕق یا تووڕەییدا).
(٢) پشت بەردان؛ ناپاکی لەگەڵ کردن؛ دەست لێ بەردان؛ پشت لێ هەڵکردن: *( He turned his back on his children.)*

**with one's back to the wall,** کرانە کونەوەو ڕێی دەربازبوون لێ- گیران؛ ڕێی دەرچوون یا دەربازبوون نەبوون؛ بێ چارە؛ چارە نەمان.

**backache** (bak′āk′), *n.* پشت ئێشە؛ ئازاری پشت.

**backbite** (bak′bīt′), *v.t. & v.i.* بەدگۆیی کردن لەپاش ملە؛ لەپاش ملە خراپە ووتن.
*n.* بەدگۆیی لەپاش ملە؛ خراپە ووتن لەپاش ملە.

**backboard** (bak′bôrd′, bak′bōrd′), *n.* (١) تەختەی پشتەوەی شتێك. (٢) تەختەی پشت ئەڵقەی تۆڕی یاری باسکە.

**backbone** (bak′bōn′), *n.* (١) بڕبڕەی پشت؛ بڕبڕاگەی پشت.
(٢) کۆڵەکە؛ بڕبڕە: *( Young men are the ~ of the country.)*
(٣) ئازایی؛ چاونەترسی؛ وورە؛ پڕکێشی: *( a man without ~ )* .
-backboned *(adj.).*

**backbreaking** (bak′brāk′iŋ), *adj.* پشت شکێن (کار)؛ زۆر گران یا قورس (ئیش).

**backdoor** (bak′dôr′, bak′dōr′), *adj.* (١) هی دەرگای پشتەوە؛ دەرگای دواوە. (٢) نهێنی؛ دزی؛ بەدزییەوە.

**backdrop** (bak′drop′), *n.* (١) پەردەی پشت شانۆ؛ دیمەنی پشت شانۆ. (٢) باری دەوروبەر.

**backed** (bakt), *adj.* پشتدار؛ پشتی هەیە: *( a low- ~ chair)* .

**backer** (bak′ēr), *n.* (١) پشتیوان؛ پاڵپشت؛ لایەنگر.
(٢) گرەوکەر؛ پارەدانەر بۆ گرەو (زۆرانبازی، پێشبڕکێ).

**backfall** (bak′fôl′), *n.* (١) بە پشتدا کەوتن. (٢) بە پشتدا کەوتوو.

(٢) لەسەر پشت کەوتن‌و درێژبوون (زۆرانبازی).

**backfield** (bak′fēld´), *n.* (١) یاریکەرانی پشتەوە (یاری فوتبۆل).
(٢) شوێنی یاریکەرانی پشتەوە (یاری فوتبۆل).

**backfire** (bak′fīr´), *n.* (١) ئاگرێکی بچووکە بەردەدرێتەوە لە دەشتدا بۆ ئاگربڕکردنی ئاگرێکی گەورەتر بە سووتاندنی بەردەمەکەی.
(٢) سووتاندنی بەنزین لەپێش کاتی خۆیدا (مەکینەی ئوتومبیل).
(٣) تەقینەوەی ئەگزۆسی ئوتومبیل.
(٤) تەقینەوەی پشتی تفەنگ.

*v.i.* (١) بەردانەوەی ئاگرێکی بچووك لە دەشتێکدا بۆ ئاگربڕکردنی ئاگرێکی گەورەتر بە سووتاندنی بەردەمەکەی. (٢) تەقینەوە (مەکینەی ئوتومبیل).
(٣) ئەنجامی خراپ دان بەپێچەوانەی چاوەڕوان کراوەوە: *( His plan ~d. )* .

**backformation** (bak´fôr-mā′shən), *n.* وشەیەکە وەرگیراوە لە وشەیەکی ترەوە بەڵام ئەم لە سەرچاوەی ئەو دەچێت.
(بۆ نموونە وشەی " burgle " لە " burglar " موە).

**backgammon** (bak′gam´ən), *n.* یاری تاولە؛ نەرد

**background** (bak′ground´), *n.* (١) پشتی دیمەن؛ دواوەی دیمەن یا وێنە. (٢) دەورووبەر؛ دەوروپشت.
(٣) دواوە؛ پشتەوە؛ شوێنی ناگرنگ (کە زۆر لەبەرچاو نەبێت):
*( He stays in the ~ .)*
(٤) بناغە؛ بنچینە؛ ڕابوردوو؛ ڕابوردووی کەسێك‌و خوێندن‌و شارەزایی‌و پیشەی:
*( What is his ~ ?; She has the right ~ for this job.)*
(٥) بنچینە (مەسەلە، باس): *( Give me the ~ of the problem.)* .
(٦) ئەو مۆسیقایەی لەگەڵ فیلم، شانۆگەری، یا بەرنامەیەکی ڕادیۆ یا تەلەفزیۆندا لێ دەدرێت: *( The ~ music was appropriate.)* .

**backhand** (bak′hand´), *n.* (١) نووسینی بە پشتدا شکاوە.
(٢) لێدانێکی تۆپ بە پشتی دەست (یاری تەنس).
*adj. & adv.* بە پشتی دەست لێدراو (تەنس).

**backhanded** (bak′han´did), *adj.* (١) بە پشتی دەست لێدراو (تەنس). (٢) بە پشتدا شکاو (نووسین).
(٣) بەتەوسەوە یا بەگاڵتەوە ئافەرین کردن: *( a ~ compliment)* .
(٤) ئاقۆڵا

**backhouse** (bak′hous´), *n.* ئاودەستی حەوشە، واتە لەناو- خانووەکەدا نییە

**backing** (bak′iŋ), *n.* (١) پاڵپشت (٢) پشتیوانی؛ لایەنگری؛ پاڵپشتی.
(٣) لایەنگران؛ پاڵپشتان؛ پشتیوانان.

**backlash** (bak′lash´), *n.* (١) گەڕانە دواوەی کوتوپڕو توند.
(٢) ئاڵۆسکان (قولاپی ڕاوەماسی)؛ گرێ خواردن
(٣) یاری کردن‌و تەقەتەق کردنی پارچەی لەقی مەکینەیەك.
(٤) پاشەلەقە (ڕووداوی کۆمەڵایەتی)؛ ئەنجامی توندوتیژی خراپ (کاری- کۆمەڵایەتی *( There was a strong ~ to the government's desegregation efforts.)*

**backlog** (bak′lôg´, bak′log´), *n.* (١) بڕەدارێکی گەورەی پشت ئاگردانێك (٢) کاری نەکراو؛ کۆمەڵە ئیشی نەکراو لەکاتی خۆیدا.
(٣) قایمەکاری

**back number,** (١) ژمارەیەکی کۆن (گۆڤار).
(٢) [Colloq.]، کەسێکی کۆنەپەرست؛ شتێکی کۆنەباو یا باونەماو.

**back order,** خواستێکی جێبەجێ نەکراو (بازرگانی).

**backpack** (bak′pak´), *n.* توورەکەی شان؛ کۆڵ.

**back pay,** مووچەی نەدراو لەکاتی خۆیدا.

**backrest** (bak′rest´), *n.* پشتی؛ پاڵپشت.

**back road,** لاڕێ؛ کوێرەڕێ.

**back seat,** (١) جێی دواوە؛ جێی پشتەوە.
(٢) [Colloq.]، جێیەکی لەبەرچاو نەبوو یا ناگرنگ.

**back-seat driver,** کەسێکی خۆهەڵقورتێنەر لە کاروباری خەڵکدا.

**backset** (bak′set´), *n.* (١) نشوستی؛ نەهامەتی؛ نەمات. (٢) گێژاو.

**backsheesh, backshish** (bak´shēsh′), *n.* = **baksheesh.**

**backside** (bak′sīd´), *n.* (١) پشت؛ پاشەڵ.
(٢) سمت؛ کەفەڵ؛ گووپی قنگ.

**backslapper** (bak′slap´ēr), *n.* [Colloq.], دەست بە پشتی- خەڵکدا دەر؛ کەسێکی ڕووخۆش‌و خەڵك دۆست.

**backslide** (bak′slīd´), *v.i.* دانە دواوە (ڕەوشت، داوێن پاکی، چاکی)؛ بەرەو خراپە ڕۆیشتن (ڕەفتار).

**backspin** (bak′spin´), *n.* بە دوادا خولانەوەی پێچکە یا ڕەوڕەوە؛ پەنتەپاش کردن.

**backstage** (bak′stāj′), *adv.* (١) لە ژووری خۆگۆڕینی پشت شانۆدا.
(٢) لەپشتەوەی شانۆدا.
*adj.* (١) لەپشتەوەی شانۆدایە.
(٢) شاراوە؛ نهێنی.

**backstair** (bak′stâr′), *adj.* = **backstairs.**

**backstairs** (bak′stârz′), *adj.* نهێنی؛ شاراوە؛ کەین‌وبەینی تێدایە؛ مەکروپیلاناوی.

**back stairs,** (١) پێ پلیکانەی پشتەوە (بۆ بەردەست‌و میوانی نهێنی لە کۆشك یا خانوویەکی گەورەدا). (٢) ڕێی چەوت‌و نهێنی‌و پیلاناوی.

**backstay** (bak′stā´), *n.* (١) گوریسێکە تەوەری کەشتییەکی بایەوان- دەبەستێت بە کەشتییەکەوە بۆ قایم کردنی. (٢) پاڵپشت.

**backstop** (bak′stop´), *n.* پەرژین یا تەیمانی دەوری یاریگە (بۆ- گرتنەوەی تۆپ).

**back street,** کوێرە شەقام؛ لاشەقام؛ شەقامی تەسك‌و ناسەرەکی.

**backstroke** (bak′strōk´), *n.* (١) لێدانێك بە پشتی دەست (تەنس).
(٢) پشتەمەلە؛ باڵ هەڵهێنانەوەیەك (پشتەمەلە).

**backsword** (bak′sôrd´, bak′sōrd´), *n.* (١) شمشێرێکی یەك دەم. (٢) بەکارهێنەری ئەم جۆرە شمشێرە.

**back talk,** [Colloq.], قسە پێ وتنەوە: وەڵامی ناشرین‌و بێ- نەزاکەتانە.

**backtrack** (bak′trak´), *v.i.* (١) گەڕانەوە بە هەمان ڕێگەدا.
(٢) گەڕانەوە بۆ دواوەو پیاچوونەوە (باس، دووان): *( Let's ~ a little bit.)* .

**backward** (bak′wērd), *adv.* (١) دواوە؛ پشتەوە.
(٢) بۆ دواوە؛ بەقنگدا؛ بەپشتدا. (٣) پاش‌وپێش.
(٤) ئاوەژوو؛ بەپێچەوانەوە؛ بەهەڵگەڕاوەیی.
(٥) بەپێچەوانەی شێوەی ئاسایی. (٦) بەرەو ڕابوردوو؛ بۆ ڕابوردوو.
(٧) بۆ دواوە؛ بەرەو خراپی؛ دانە دواوە:
*( Instead of going forward, the country is going ~ .)*
*adj.* (١) بەرەو دوا؛ بۆ پشتەوە. (٢) پاش‌وپێش. (٣) ئاوەژوو.
(٤) نابەدڵ؛ شەرمن؛ کەم ڕوو؛ ترسنۆك.
(٥) دواکەوتوو (گەل، مرۆڤ): *( a ~ country, region, etc.)* .
-backwardly *(adv.)*; **backwardness** *(n.).*

**backwards** (bak′wērdz), *adv.* = **backward.**

**backwash** (bak′wôsh´, bak′wäsh´), *n.* (١) ئاوی پاڵ پێوەنراو بۆ دواوە (بە سەوڵ، بەلەم، یا کەشتی).
(٢) تەووژمی بەرەو دواوەی با (پەروانەی فڕۆکە).
(٣) ئەنجام (بەتایبەتی هی ناپەسەند)؛ کارئەنجام.

**backwater** (bak′wô´tēr, bak′wä´tēr), *n.* (١) ئاوی پەنگ- خواردووەوە (لەپشت بەنداوێکەوە). (٢) ئاوی پەنگ خواردووەوە و بۆگەن.
(٣) شوێنێکی چەپەك، وشك، مردوو و دواکەوتوو؛ بارێکی وشك‌و ناخۆش:
*( He lives in a cultural ~ .)*
*adj.* دواکەوتوو؛ وشك‌و ناخۆش؛ مردوو (شوێن، شار).

**backwood** (bak′wood´), *adj.* = **backwoods.**

**backwoods** (bak′woodz´), *n.pl.* (١) دارستانی چۆڵ‌و دوور لە- ئاوایییەوە. (٢) [Colloq.]، شوێنێکی دوور‌و چەپەك‌و دواکەوتووی کەم

خەڵك تێدا ژیاو؛ کوێرەدێ.
**adj.** تایبەتی بە دارستانی چۆڵ و دوور لە شار؛ تایبەتی بە شوێنی چەپەك و دواکەوتووی کەم خەڵك تێدا ژیاو.
**backwoodsman** (bak′woodz′mən), ***n.*** نیشتەجێی کوێرەدێ؛ خەڵکی چوڵەوانی.
**bacon** (bā′kən, bā′k′n), ***n.*** توێی تەنکی گۆشتی سوێرکراوی بەراز (بەیانیان بە سوورەوەکراوی لەگەڵ هێلکەورۆندا دەخورێت).
**bring home the bacon,** [Colloq.], (١) پارە پەیداکردن و ماڵ و مندال بەخێوکردن. (٢) سەرکەوتن.
**save one's bacon,** لە مردن یا زیان پێ گەیشتن ڕزگاربوون.
**bacteremia** (bak′tə-rē′mi-ə), ***n.*** بوونی بەکتریا لەناو خوێندا.
**bacteria** (bak-têr′i-ə), ***n.pl.*** بەکتریا؛ میکرۆب؛ خۆرە.
**bacterial** (bak-têr′i-əl), ***adj.*** بەکتریایی؛ میکرۆبی؛ خۆرەیی.
**bactericide** (bak-têr′ə-sīd′), ***n.*** بەکتریاکوژ؛ میکرۆب کوژ.
**bacterin** (bak′tə-rin), ***n.*** بەکترین: دەرمانی کوتان.
**bacterio-** (bak-têr′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: بەکتریایی.
**bacteriologic** (bak-têr′i-ə-loj′ik), ***adj.*** تایبەتی بە بەکتریا- ناسی.
**-bacteriological** ***(adj.).***
**bacteriologist** (bak-têr′i-ol′ə-jist), ***n.*** بەکتریازان؛ زانای بەکتریا؛ میکرۆب ناس.
**bacteriology** (bak-têr′i-ol′ə-ji), ***n.*** بەکتریازانی؛ زانستی بەکتریا؛ میکرۆب ناسی.
**bacteriolysis** (bak-têr′i-ol′ə-sis), ***n.*** شیبوونەوەی بەکتریا؛ داڕزانی بەکتریا؛ لەناوچوون یا لەناوبردنی بەکتریا.
**-bacteriolytic** ***(adj.).***
**bacteriophage** (bak-têr′i-ə-fāj′), ***n.*** زیندەوەرێکی گەردبینە میکرۆب ئەکوژێت؛ میکرۆب کوژ.
**bacterioscopy** (bak-têr′i-os′kə-pi), ***n.*** لێکۆڵینەوەی بەکتریا بە گەردبین.
**bacteriostasis** (bak-têr′i-ə-stā′sis), ***n.*** نەهێشتنی پەرەسەندنی بەکتریا
**-bacteriostatic** ***(adj.).***
**bacterium** (bak-têr′i-əm), ***n.*** *singular of* bacteria.
**bacterize** (bak′tēr-īz′), ***v.t.*** بە بەکتریا گۆڕین؛ گۆڕین بەهۆی بەکتریاوە.
**-bacterization** ***(n.).***
**bacteroid** (bak′tēr-oid′), ***adj.*** لە بەکتریا دەچێت؛ بەکتریایی.
***n.*** بەکتریایەکی شێوە گۆڕاو.
**Bactrian camel,** حوشتری دوو کۆپارە.
**baculiform** (ba-kū′lə-fôrm′), ***adj.*** لە داردەست چوو؛ چیلکەیی.
**baculine** (bak′yoo-lin, bak′yoo-līn′), ***adj.*** داردەستی؛ هی دارکاری کردن؛ تایبەتی بە دارکاری.
**bad** (bad), ***adj.*** (١) خراپ؛ بەد؛ ناپەسەند؛ گەنگ؛ ناشرین؛ قەلب.
(٢) بەکارنەهاتوو؛ ناکارامە؛ نەشیاو. (٣) ناخۆش؛ خراپ: ***(~ news)*** .
(٤) ترشاو؛ بۆگەن: ***(a ~ egg)*** .
(٥) پڕ لە هەڵە؛ هەڵە: ***(~ spelling, grammar, etc.)*** .
(٦) پیس؛ نابەجێ؛ ناشرین (زمان): ***(~ language)*** .
(٧) بەدڕەوشت؛ بەدڕەفتار؛ بەدخوو؛ بەدکار: ***(a ~ man)*** .
(٨) زیانبەخش: ***(~ for health)*** . (٩) توندوخراپ؛ قایم: ***(a ~ storm)*** .
(١٠) نەخۆش: ***(in ~ health)*** .
(١١) پەشیمان؛ نیگەران: ***(He feels ~ about it.)*** .
(١٢) پیس؛ بۆگەن: ***(a ~ smell)*** .
(١٣) نادروست؛ بەکارنایەت؛ ناگۆڕدرێتەوە (چەك)؛ بەتاڵ: ***(a ~ check)*** .
***n.*** (١) شتێکی خراپ، بەد، یا ناپەسەند.
(٢) بەدڕەفتاری؛ بەدکاری؛ بێ ڕەووشتی.
(٣) بەدڕەفتاران؛ بەدکاران؛ بەدڕەووشتان: ***(the ~)*** .
**bad at,** ناکارامە؛ لێی نازانێ.
**from bad to worse,** هەتا دەبێت بەرەو خراپتر دەچێت؛ لە خراپەوە بۆ خراپتر دەڕوات.
**go bad,** بۆگەن کردن؛ بۆن کردن؛ خراپ بوون:
***(Some foods go bad in room temperature.)***
**go to the bad,** [Colloq.], بەدڕەفتاربوون؛ بەدڕەووشت بوون.
**not bad,** [Colloq.], خراپ نییە؛ باش؛ مام ناوەندی.
**not so bad,** [Colloq.], خراپ نییە؛ باش؛ مام ناوەندی.
**too bad,** داخەکەم؛ حەیف!؛ حەیفە!.
**bad** (bad), **1.** *archaic past tense of* bid.
**2.** *obsolete past tense of* bide.
**bad blood,** دوژمنایەتی؛ قینەبەرایەتی؛ ڕقەبەرایەتی؛ ناحەزی:
***(There's bad blood between them.)***
**bade** (bad), **1.** *alternative past tense of* bid.
**2.** *alternative past tense of* bide.
**bad egg,** [Slang], کەسێکی ناپەسەندو بێ فەڕو ناڵەبار.
**badge** (baj), ***n.*** (١) نیشان (پلەی فەرمانبەر): ***(a police ~)*** .
(٢) نیشانە؛ نیشان (شانازی، شەرمەزاری):
***(a ~ of courage; a ~ of shame)***
***v.t.*** نیشانەکردن؛ نیشان لێدان؛ نیشان پێوەنان.
**badger** (baj′ēr), ***n.*** (١) گۆڕهەڵکەنە؛ چوالوو.
(٢) کوڵ یا فەروەی گۆڕهەڵکەنە.
(٣) [B-]، دانیشتوویەکی ویلایەتی " ویسکۆنسن " ی ئەمەریکا.
***v.t.*** سەر کونکردن؛ مێشك کونکردن؛ سەر خستنەسەر؛ پەستکردن:
***(He has been ~ing his father to buy him a camera.)***
**badinage** (bad′′n-ij, bad′i-näzh′), ***n.*** گاڵتەوگەپ.
**badlands** (bad′landz′), ***n.pl.*** زەوییەکی ڕووتەنی کە ناو خواردبێتیەوە و شێوەی سەیرسەیری لێ دروست کردبێت.
**badly** (bad′li), ***adv.*** (١) خراپ؛ بەشێوەیەکی خراپ؛ ناپەسەندانە:
***(He was treated ~. ; She behaved very ~.)***
(٢) خراپ کراو: ***(a ~ made shirt)*** .
(٣) زۆر؛ نێچگار خراپ: ***(He was wounded ~.)***
(٤) [Colloq.]، زۆر؛ نێچگار زۆر: ***(He wants that job ~.)*** .
**badminton** (bad′min-tən), ***n.*** تەنسی تۆپی پەڕدار.
**bad-tempered** (bad′tem′pērd), ***adj.*** تووڕەوتڕۆ؛ تەنگەچیکڵانە.
**baffle** (baf′′l), ***v.t.*** (١) سەرسووڕماندن؛ حەپەساندن؛ واق وڕماندن؛ تێنەگەیشتن: ***(Her strange behavior ~s me. ; One of the exam questions ~d me completely.)***
(٢) بەرگرتن؛ ڕێ لێگرتن؛ بەرهەڵستی کردن؛ نەهێشتن.
***v.i.*** هەوڵدان بەبێ ئەنجام دەستگیربوون.
***n.*** (١) واق وڕمان؛ سەرسووڕمان؛ پەشۆکان؛ سەرسام بوون.
(٢) تیغە دیوارێك یا پەردەیەکە بۆ بەربەست کردنی شلە یا گازو هەوا.
(٣) هۆی وەرگرتنی بەرنامەی رادیۆ بەڕوونی.
**-bafflement** ***(n.)***; **baffler** ***(n.).***
**baffling** (baf′liŋ), ***adj.*** (١) واق وڕمێنەر؛ سەرسووڕمێنەر؛ سەیر؛ تێگەیشتنی زۆر گرانە: ***(a ~ person, situation, etc.)***
(٢) ڕێ لێگر (کەشتیەوانی)؛ بەرگر (با)؛ کۆسپ.
**bag** (bag), ***n.*** (١) توورەکە؛ کیسە؛ جەواڵ؛ دەفر؛ زەرف؛ هەگبە.
(٢) باوەڵ؛ جانتا. (٣) جانتای دەستی ژنان.
(٤) توورەکەیەکە گیانداری ڕاوکراوی تێ دەخرێت.
(٥) سەرجەمی گیانداری ڕاوکراو و خراوە توورەکە لە ڕۆژێکدا.
(٦) توورەکەیەك شت؛ پڕ توورەکەیەك. (٧) شتێکی لە توورەکە چوو.
(٨) ئاوساویی؛ بەشی ئاوساوی شتێك. (٩) گوان (گیاندار).

(١٠) كيسى شلەى ناولەش.
(١١) [Slang]، ئافرەت (بەتايبەتى يەكێكى ناشرين):
*( a disagreeable old ~ )*
*v.t.* (١) دەرپۆقين؛ ئاوساندن.
(٢) خستنە توورەكەوە؛ كردنە كيسەوە (شتومەك): *( to ~ grocery)* .
(٣) گرتن (جێگە)؛ دەست بەسەرداگرتن: *( to ~ the best chair)* .
(٤) كوشتن (ڕاو) (٥) [Slang]، دەست كەوتن؛ چنگ كەوتن؛ كۆكردنەوە.
*v.i.* (١) ئاوسان (وەك توورەكەيەكى پڕ)؛ دەرپۆقين.
(٢) شۆڕبوونەوە؛ بە دەلَبى وەستان يا شۆڕبوونەوە.
**bag and baggage,** [Colloq.], (١) بە هەموو شتەكانىيەوە؛ خۆىو هەموو شتەكانى؛ بە سەروماڵەوە:
***( He moved out bag and baggage.)***
(٢) بەتەواوى؛ هەمووى.
**be in the bag,** [Slang], مسۆگەر: لە دەستدايە؛ دەسكەوتنى گومانى تێدا نىيە
**let the cat out of the bag,** نهێنى دركاندن (بەبێ دەسەنقەست).
**bagasse** (bə-gas′), *n.* تلپەى قاميشى شەكر.
**bagatelle** (bag´ə-tel′), *n.* (١) شتێكى هيچوپووچ.
(٢) يارىيەكە لە بليارد دەچێت
(٣) پارچە مۆسيقايەكى كورت (بۆ پيانۆ).
**bagel** (bā′g'l), *n.* بەيگل. مارمارۆكەيەكى خڕە؛ خەپلە نانێكى ئەستوورە ناوەڕاستەكەى كوناودەرە.
**bagful** (bag′fəl), *adj.* پڕ توورەكەيەك؛ پڕ كيسەيەك؛ زۆر.
**baggage** (bag′ij), *n.* (١) بارگە؛ كەلوپەلى ڕێبوار؛ جانتاى ڕێبوار.
(٢) ئازووقەو بارگەى سوپا. (٣) (ا) ئافرەتێكى سووك؛ قەحبە.
(ب) ئافرەتێكى بێ حەياو چەقاوەسوو.
**baggage-master** (bag′ij-mas´tẽr), *n.* لێپرسراوى وەرگرتنو ناردنى جانتاو كەلوپەلى ڕێبواران لە ئيستگەى شەمەندەفەردا.
**baggie** (bäg′i, beg′i), *n.* (١) توورەكەيەكى بچووك.
(٢) وورگ؛ سك.
**bagginess** (bag′i-nis), *n.* دەلَبى؛ زلى (جلوبەرگ).
**baggy** (bag′i), *adj.* دەلَب؛ شۆڕبووەوە (جلوبەرگ)؛ زل بەبەر:
*( ~ clothes, pants, etc.)*
**-baggily** *(adv.).*
**bagman** (bag′mən), *n.* (١) فرۆشيارى گەڕۆك (ئينگلتەرە).
(٢) [Colloq.]، دەلالَى بەرتيل وەرگر بۆ خەلكى تر.
**bagnio** (ban′yō, bän′yō), *n.* (١) سەرشۆرك؛ گەرماو؛ بانيۆ.
(٢) بەنديخانە. (٣) قەحبەخانە.
**bagpipe** (bag′pīp´), *n.* جووزەلەو شمشالى ئێرلەندەو ئوسكوتلەندە؛ زوڕنا
**bagpiper** (bag′pīp´ẽr), *n.* جووزەلەو شمشاڵ لێدەرى ئێرلەندەيىو ئوسكوتلەندەيى
**bah** (bä, ba), *interj.* بەهبەه: دەنگێكە نارەزايىو بێزهاتنەوەو گالَتەپێكردن دەردەبڕێت.
**Bahai** (bə-hä′ē), *n.* (١) بەهايى؛ پەيرەويكەرێكى ئاينى بەهايى.
(٢) ئاينى بەهايى كە بەهائوللا لە ئێران دايمەزراند سالَى ١٨٦٣.
**-Bahaism** *(n.)*; **Bahaist** *(n.).*
**bail** (bāl), *n.* (١) دەستەبەرى؛ دەستەبەربوونى بەندێك؛ كەفالەت.
(٢) ئەو پارەيەى دەستەبەر دايدەنێت بۆ بەردانى كەسێكى گيراو.
(٣) بەرەلاكردنى كەسێكى گيراو بە دەستەبەرى. (٤) دەستەبەر؛ كەفيل.
*v.t.* (١) ( ~ out )، دەستەبەربوونى كەسێكى گيراوو بەردانى؛ بەرەلاكردنى كەسێك بە كەفالەت كردنى.
(٢) ( ~ out )، بەرەلاكردنى بەندێك پاش لێوەرگرتنى كەفالەت.
(٣) دانانى شتومەك لاى كەسێك يا لە شوێنێك بە سەردەمى.
(٤) ( ~ out )، [Colloq.]، ڕزگاركردن لە تەنگوچەلەمە:
*( No one will ~ you out this time.)*
**bail (a person) out,** (١) دەستەبەربوونو بەرەلاكردنى بەندێك.
(٢) ڕزگاركردن؛ فرياكەوتن.
**jump bail,** ڕاكردنو خۆشاردنەوە لەكاتى بەرەلابووندا بە كەفالەت.
**out on bail,** بە كەفالەت بەرەلاكراوە.
**bail** (bāl), *n.* دۆلكە (بۆ دەردانى ئاو لە بەلەمێك)؛ سەتل.
*v.i. & v.t.* (١) ئاو لە بەلەم دەردان بە دۆلكە يا سەتل.
(٢) ئاو يا شلە دەردان بە دۆلكە يا سەتل.
**bail out,** خۆفڕێدان لە فڕۆكەوە بە پەڕەشووت.
**bail** (bāl), *n.* (١) دەسك (دۆلكە، سەتل، كتلى). (٢) ئەلَقەى چەتر.
**bail** (bāl), *n.* (١) (ا) ديوارى دەرەوەى قەلايەك.
(ب) حەوشەى دەورەگيراو بەم ديوارە.
(٢) (*pl.*)، تەيمان؛ تەيمانێكى درووستكراو لە سنگى ئەستوورو نووك تيژ.
(٣) دار يا شيشى لەيەك جياكردنەوەى وولاخ لە تەويلەيەكدا.
**bailable** (bāl′ə-b'l), *adj.* بە كەفالەت بەرەلا دەكرێت؛ دەستەبەرى دەكرێت.
**bail bond,** بارمتەى دەستەبەرى (پارە، زێڕ، خانوو).
**bailee** (bāl´ē′), *n.* بارمتەى دەستەبەرى لادانراو.
**bailey** (bā′li), *n.* (١) ديوارى دەرەوەى قەلا يا كۆشك.
(٢) حەوشەى ناو ئەم ديوارە.
**bailiff** (bāl′if), *n.* (١) پۆليسى دادگا.
(٢) پەيامبەرو جێبەجێكەرى فەرمانى دادگا (كە پۆليسە).
(٣) كاربەدەستى ناوچەيەك كە دەسەلاتى باج كۆكردنەوەو دادگەريشى هەيە (ئينگلتەرە). (٤) سەركار (زەوىوزار، خانووبەرە).
**bailiwick** (bāl′ə-wik´), *n.* (١) ناوچەى دەسەلاتدارىى **bailiff** .
(٢) پشتە؛ سنوورو ناوچەى دەسەلاتو شارەزايى.
**bailment** (bāl′mənt), *n.* (١) دەستەبەربوون (بەند)؛ دەستەبەرى؛ كەفالەت. (٢) بارمتە دانان.
**bailor** (bāl′ôr´, bāl′ẽr), *n.* بارمتەدانەر.
**bailsman** (bālz′mən), *n.* دەستەبەر (بەند)؛ كەفيل.
**bait** (bāt), *v.t.* (١) سەگ تێكردن (بەتايبەتى گياندارێكى دڕندەى گيراوو بەستراوە هەر بۆ سەير):
***( People formerly ~ed animals for amusement.)***
(٢) چەوساندنەوە بە توانجو گالَتەپێكردنو شەڕ پێ فرۆشتن؛ سەر خستنەسەر
(٣) [Rare]، ئاليكدانى وولاخ (لە پشوويەكدا لەكاتى گەشت كردندا).
(٤) دان دان (ڕاوەماسى، تەلَە، تەپكە)؛ دانەخۆرە بۆ دانان.
(٥) فريودان؛ دان بۆ ڕۆكردن.
*v.i.* پشوودان لە گەشتدا (بۆ ئاليكدانى وولاخو نان خواردن).
*n.* (١) (ا) دان (قولاپى ماسى گرتن، تەلَە، تەپكە)؛ دانەخۆرە:
*( What do you use for ~ ?)*
(ب) خۆراكى ژەهراوى (كە وەك دان بەكاردەهێنرێت بۆ كوشتنى جانەوەر):
*( snail ~ )*
(٢) شتێك كە نێچيرى پێ هەلَبفريوێنرێتو پێ‌ى بگيرێت؛ دان؛ دانەخۆرە.
(٣) پشووى گەشت (بۆ ئاليكدانى وولاخو نان خواردن).
**-baiter** *(n.).*
**baize** (bāz), *n.* قوماشێكى سەوزە بۆ سەرمێزى بلياردو يارى تر.
**bake** (bāk), *v.t.* (١) (ا) نان كردن: *( to ~ bread)* .
(ب) پيشاندن (تەنوور، فڕن).
(٢) سووركردنەوە (گۆزەوديزە، خشت)؛ ووشك كردن (خشت).
(٣) خۆهەلَخستن لەبەر خۆر.
*v.i.* (١) نان كردن. (٢) سووربوونەوە؛ پيشان.
(٣) ووشك بوونەوە لەبەر خۆر (خاك، زەوى، خشت).
*n.* (١) پيشان؛ ووشك بوونەوە؛ سووربوونەوە.
(٢) شتێكى پيشاو، ووشك كراوە، يا سووركراوە.
**bakehouse** (bāk′hous´), *n.* شوێنى تەنوورو فڕن لە نانەواخانەدا؛

نانەواخانە

**baker** (bāk′ēr), ***n.*** نانەوا؛ نانکەر؛ دروستکەری پاقلاوەو شیرینی تر.

**baker's dozen,** دەرزەنی نانەوا (کە بریتی‌یە لە سیانزە لەبری دوانزە)؛ خاترانە؛ سلاودانەوە.

**bakery** (bāk′ēr-i, bāk′ri), ***n.*** (١) نانەواخانە؛ دووکانی دروست- کردن و فرۆشتنی نان و کێك و پاقلاوەو شیرینی تر.
(٢) فرۆشگای نان و شیرینی.

**baking** (bāk′iŋ), ***n.*** (١) نان کردن؛ پیشاندن؛ سوورکردنەوە لە فڕندا.
(٢) ئەوەندەی بە یەك جار دەکرێت، دەپیشێنرێت یا سووردەکرێتەوە لە فڕندا.
(٣) ووشك کردنەوە (بە خۆر یا بە ئاگر).

**baking powder,** تۆزێکە وەك هەویرترش لە نان کردندا بەکاردێت هەروەها لە لێنانی چەند خواردەمەنی‌یەکی تردا؛ هەویرترش لەشێوەی تۆزدا؛ ترشێنە؛ ترشەڵۆك.

**baking soda,** بیکاربۆناتی سۆدیۆم؛ سۆدەی نان (لە هەویرترش و دەرمانی دژی ترشیدا بەکاردەهێنرێت).
(هەروەها پێشی دەووترێ: " sodium bicarbonate " ).

**baksheesh, bakshish** (bak´shēsh′), ***n.*** بەخشیش

**balalaika** (bal´ə-lī′kə), ***n.*** ئامێرێکی مۆسیقایی ڕووسی‌یە وەك عوود وایە بەڵام ئەم بنەکەی سێگۆشەیی‌یە.

**balance** (bal′əns), ***n.*** (١) تەرازوو
(٢) تەرازووی گەردوون.
(٣) هاوتایی؛ هاوسەنگی؛ هاوتەرازوویی.
(٤) لەنگەر (لەش): *( He lost his ~ and fell. He kept his ~ on the tightrope.)*
(٥) ژیری؛ هێمنی؛ لەنگەری مێشك و هەست:
*( He kept his ~ during the crisis.)*
(٦) هاوتایی (نەخشە، وێنە)؛ هاوڕێژەیی؛ یەك ئەوایی؛ گونجان؛ ڕێکەوتن.
(٧) هاوتا؛ کێشی هاوتا. (٨) مایە (حسابی بانق).
(٩) لاسەنگی ئەم مایەیە یا حسابە. (١٠) قەرز؛ ئەوەی دەمێنێتەوە لە قەرزێك.
(١١) تاوتووکردن؛ هاوسەنگی کردن.
(١٢) [B-]، کۆنەستێرەی تەرازوو. (١٣) [Colloq.]، لێ ماوە؛ ماوە؛ باقی.

***v.t.*** (١) کێشان (٢) بەراوردکردن.
(٣) تاوتووکردن؛ هاوتاکردن؛ هاوسەنگ کردن.
(٤) لەنگەرگرتن: *( He ~d himself on the tightrope.)* .
(٥) هاوتابوون؛ هاوسەنگ بوون.
(٦) هاوتاکردنی حساب (بانق)؛ هاوتاکردنی قەرزاری و ڕەسید:
*( to ~ a checkbook)*
(٧) بڕینەوەی حسابێك بە دانەوەی لێماوەی قەرزەکە.

***v.i.*** (١) هاوتابوون؛ هاوسەنگ بوون؛ هاوتەرازووبوون.
(٢) هاوتابوونی قەرزو ڕەسید. (٣) لەنگەرگرتن.
(٤) بەملاو بەولادا کەوتن و لەنگەرگرتن.

**in the balance,** ئەنجامی هێشتا نەزانراوە؛ بڕیار نەدراوە؛ لە مەترسیدایە:
*( The fate of an entire nation is hanging in the balance.)*

**balanced** (bal′ənst), ***adj.*** هاوتا؛ هاوسەنگ؛ هاوکێش؛ ژیر.

**balanced diet,** خۆراکی هاوتا: خواردەمەنی هەمەچەشن کە پرۆتین و نیشاستەو ڤیتامیناتی بەگوێرەی یەکتری تێدابێت.

**balanced sentences,** ڕستەی هاوتا (زمانەوانی).

**balance of power,** هاوهێزی (نێوان وڵاتان یا حیزبەکان)؛ تەرازووی هێز

**balance of trade,** تەرازووی بازرگانی: جیاوازی نێوان هاوردەو ناردەی وڵاتێك؛ هاوتایی بازرگانی.

**balancer** (bal′ən-sēr), ***n.*** (١) هاوتاکەر (٢) تەنافباز.
(٣) ئەندامی لەنگەرگرتنی جانەوەرێك (وەك مێش، مێشوولە).
(٤) ئامێری سافکەر (رادیۆ).

**balance sheet,** تەرازوونامە: کورتەی حسابی کۆمپانیایەك کە سەرمایەو دەسکەوت و سوودو زیانی کۆمپانیاکە پیشان دەدات لە کۆتایی وەرزێکدا؛ بووجە.

**balance wheel,** پێچکەی هاوتاکەر (کاتژمێر، مەکینە).

**balata** (bal′ə-tə), ***n.*** (١) دارێکی زلی ئەمەریکای باشوورە.
(٢) شیلەی ئەم درەختەیە کە دەکرێت بە لاستیك.

**balbriggan** (bal-brig′ən), ***n.*** (١) تەنراوێکی لۆکەیە (گۆرەوی و جل‌وبەرگی ژێرەوەی لێ دروست دەکرێت).
(٢) (*pl.*)، جل‌وبەرگی لەم تەنراوە دروستکراو.

**balconied** (bal′kə-nid), ***adj.*** تەلاردار؛ باڵکۆندار؛ تارمەدار.
*( a ~ house)*

**balcony** (bal′kə-ni), ***n.*** (١) تەلار؛ باڵکۆن؛ تارمە.
(٢) نهۆمی سەرەوەی سینەما یا هۆڵی کۆبوونەوە.

**bald** (bôld), ***adj.*** (١) سەر ڕووتاوە؛ ڕووتاوە:
*( a ~ head, person, spot, etc.)*
(٢) سەر سپی (باڵندە، گیاندار)؛ مارۆ. (٣) ڕووت‌وقووت؛ ڕووت.
(٤) نە ڕازاوە؛ سادە؛ ڕووت. (٥) لەڕوو (ووتە)؛ ڕەق: *( a ~ statement)*
-baldness *(n.).*

**baldachin, baldaquin** (bal′də-kin, bôl′də-kin), ***n.*** - (١) تەنراوێکی ڕازاوەی جوانە (لە کۆندا لە " بەغدا " لە زێڕو ئاوریشم دروست دەکرا). (٢) چەترێکە لەم قوماشە دروستکراوە لە خۆپیشاندانی ئایینیدا هەڵدەگیرێت. (٣) چەترێکی مەڕمەڕ یا بەردە بەسەر قوربانیگای کڵێسەوە.

**bald eagle,** سیسارکێکی گەورەو بەهێزی ئەمەریکای باکوورە هەراشەکانیان پەڕی سپی بە سەرو ملیانەوەیە.

**balderdash** (bôl′dēr-dash´), ***n.*** قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا؛ قسەی قۆڕ؛ نووسراوی هیچ‌وپووچ.

**baldhead** (bôld′hed´), ***n.*** (١) کەسێکی سەر ڕووتاوە.
(٢) وولاخی مارۆ؛ باڵندەیەك یا گیاندارێك کە پەڵەیەکی سپی بەسەر تەوقی سەری‌یەوە بێت.

**bald-headed** (bôld´hed′id), ***adj.*** (١) سەر ڕووتاوە.
(٢) مارۆ؛ پەڵەیەکی سپی بەسەر تەوقی سەری‌یەوەیەتی؛ سەر سپی.

**baldpate** (bôld′pāt´), ***n.*** (١) کەسێکی سەر ڕووتاوە.
(٢) مراوی‌یەکی ئەمەریکی‌یە تەوقی سەری سپی‌یە.

**baldric** (bôl′drik), ***n.*** قایشی شان (شیر یا زوڕنای پێوەدەکرێت)؛ شیرپاگر.

**bale** (bāl), ***n.*** مەڵۆ؛ گوورزە؛ بەستەك؛ فەردە: *( a ~ of hay)* .

***v.t.*** کردن بە گوورزە، مەڵۆ، یا فەردە؛ گوورزەکردن؛ فەردەکردن.

**bale** (bāl), ***n.*** [Poetic], (١) وەی؛ کارەسات؛ زیان.
(٢) سوێ؛ خەم؛ دڵ سووتان؛ ناخۆشی.

**baleen** (bə-lēn′), ***n.*** ئێسقانی زۆر باریکی کاژێری سەرەوەی نەهەنگ.

**balefire** (bāl′fīr´), ***n.*** (١) ئاگرەخۆشە. (٢) ئاگری پەیام ناردن.
(٣) [Obs.]، ئاگری سووتاندنی لاشەی مردوو (ئاین).

**baleful** (bāl′fəl), ***adj.*** (١) بەدخواز؛ نیازخراپ؛ زیانبەخش؛ کوشندە؛ ناپەسەند: *( a ~ look)* . (٢) بەدووم؛ نیشانەی خراپ.

**Balinese** (bä´li-nēz′), ***adj.*** تایبەتی بە دوورگەی " بالی " لە ئیندونیزیا (گەل، زمان، کلتوور).

***n.*** (١) هاووڵاتی‌یەکی " بالی " . (٢) زمانی " بالی " .

**balk, baulk** (bôk), ***n.*** (١) سەردێراو؛ کونجێکی نەکێڵراوی زەوی بۆ دانان بە سنوور یا لەبەر لەبیرچوون. (٢) دار یا تەختەیەکی باش نەبڕراوە.
(٣) نیرگە؛ دەستەك. (٤) کۆسپ؛ قۆرت؛ نشوستی؛ پێ لێ گیران. (٥) هەڵە.
(٦) ئەو شوێنەی مێزی بلیارد کە یاری‌یەکەی لێوە دەست پێ دەکرێت.

***v.t.*** (١) (ا) خۆدزینەوە (ئەرکی سەرشان).
(ب) لە دەستی خۆ دان بە دەسەنقەست (هەل)؛ نەکردن.
(٢) پێ لێگرتن؛ بەرگرتن؛ لێ تێکدان: *( to be ~ed in one's plans)* .
(٣) [Obs.]، سەردێراو دروستکردن.

*v.i.* (١) مان گرتن (هێستر، ئەسپ).
(٢) ~ at ؛ سڵ کردنەوە؛ خۆ لێ لادان: *( She ~s at nothing. ; He ~ed at the very idea of compromise.)*
**Balkan** (bôl′kən), *adj.* (١) بەڵقانی؛ تایبەتی بە ناوچەی بەڵقان.
(٢) بەڵقانی (گەل، کلتوور). (٣) تایبەتی بە شاخەکانی بەڵقان.
**Balkanize** (bôl′kən-īz′), *v.t. & v.i.* وەك بەڵقان لێکردن:
دابەشکردن بە وڵاتی بچووك بچووك‌و دوژمن بەیەکتری (وەك ناوچەی بەڵقان دوای جەنگی جیهانیی دووەم).
-**Balkanization** *(n.).*
**balk line,** (١) هێڵی دەستپێکردنی (ملەملێ، پێشبڕکێ)؛ هێڵی دەرپەڕین یا گوربەستنەوە (٢) (ا) هێڵی سەرمێزی بلیارد کە یارییەکە لەدوایەوە دەستی پێ دەکرێت (ب) یەکێك لە چوار هێڵەکەی سەرمێزی بلیارد.
**balky** (bôk′i), *adj.* مان گر؛ سر کەرەوەو وەستاو: *( a ~ horse)* .
**ball** (bôl), *n.* (١) خڕە؛ شتێکی خڕ. (٢) زەوی؛ خڕی زەوی؛ سەرزەوی.
(٣) تۆپ؛ تۆپی یاری. (٤) یاری بە تۆپ کراو (بەتایبەتی بێسبۆڵ).
(٥) تۆپ هەڵدان؛ تۆپ لێدان. (٦) گوللە تۆپ.
(٧) ئەندامێکی خڕی لەش (بەتایبەتی قنگە پاژنەی پێ). (٨) گلێنەی چاو.
(٩) گۆ. (١٠) تۆپەڵ (١١) فیسقە؛ سەلك؛ پیازۆکە (١٢) گلۆلە.
*v.i. & v.t.* خڕبوون؛ تۆپەڵ بوون؛ وەك تۆپ لێهاتن.
**ball up,** [Slang], سەر لێ شێوان؛ سەر لێ تێکدان.
**be on the ball,** [Slang], وورِیا؛ کارامە؛ لێهاتوو؛ توانا بەسەردا شکاو.
**carry the ball,** (١) تۆپ بەدەستەوەبوون‌و هەوڵی یاری کردن دان (فوتبۆڵی ئەمەریکی). (٢) [Colloq.]: ئەرك بەسەر شانەوە بوون؛ دەستپێشکەری کردن؛ ئەرك هەڵگرتن.
**keep the ball rolling,** بەردەوام بوون (دووان، کار).
**play ball,** (١) دەستکردن بە یاری؛ دەستکردنەوە بە یاری
(٢) دەستکردن بە کارێك؛ دەستپێکردنەوە.
(٣) [Colloq.]. هاوکاری کردن.
**ball** (bôl), *n.* ئاهەنگی سەماو هەڵپەرکێ.
**have a ball,** [Slang], خۆش ڕابواردن؛ کەیف کردن
**ballad** (bal′əd), *n.* (١) بەستە؛ بەستەیەکی یەك ئاواز؛ گۆرانی؛ بەستەیەکی بەسۆز.
(٢) چیرۆکێك یا هەڵبەستێکی بە گۆرانییەوە ووتراو؛ هەڵبەست.
**ballade** (bə-läd′, ba-läd′), *n.* (١) هەڵبەستێکی سێ بەش کە هەر بەشەی لە هەشت دێڕ پێکهاتبێت.
(٢) هەڵبەستێکی مۆسیقایی بۆ پیانۆ یا ئۆرکێسترا نووسراو.
**balladeer** (bal′ə-dêr′), *n.* بەستەبێژ؛ گۆرانی بێژ؛ گۆرانی چیرۆکی بێژ
**balladmonger** (bal′əd-muŋ′gẽr), *n.* (١) بەستەدانەر؛ گۆرانی چیرۆکی نووس؛ دانەرو فرۆشیاری بەستە.
(٢) هۆنەرێکی خراپ‌و لێنەهاتوو.
**balladry** (bal′əd-ri), *n.* (١) بەستە بەگشتی؛ گۆرانی چیرۆکی بەگشتی (٢) بەستە دانان؛ گۆرانی چیرۆکی دانان.
**ball and chain,** (١) تۆپێکی ئاسنی قورسە بە زنجیر بەندی پێ پێوەند دەکرێت (٢) [Slang]. تەوق (ژن یا مێرد).
**ball-and-socket joint,** جومگەی خڕی خولاو جومگەیەکە بەئاسانی بە هەموولایەکدا دەجوولێت، لە سەرێکی خڕ پێکهاتووە لەناو چاڵاییەکدا (وەك جومگەی شان‌و سمت).
**ballast** (bal′əst), *n.* (١) شتێکی قورسە دەخرێتە کەشتی یا باڵۆنەوە بۆ لەنگەرگرتن (٢) شتی پتەوکەر (سرووشت‌و ڕەووشتی مرۆڤ، پەیوەندی نێوان مرۆڤ). (٣) چەو یا بەردی شکاو (بۆ چەورێژ یا نێوان هێڵی شەمەندەفەر).
*v.t.* (١) پتەوکردن؛ چەسپاندن؛ لەنگەرپێگرتن.
(٢) چەورێژکردن؛ پڕکردنەوەی نێوان هێڵی شەمەندەفەر بە چەو.
**ball bearing,** بۆلبرینگ (ئوتومبیل).
**ball cock,** ئامێرێکە بریتییە لە دەمەوانەیەکی بەستراو بە تۆپێکی سووکەوە ئاستی ئاوی پێ ڕێك دەخرێت لە تەنکی ئاوی ئاودەستخانەی ڕۆژئاواییدا.
**ballerina** (bal′ə-rē′nə), *n.* سەماکەری باڵێ (ئافرەت).
**ballet** (bal′ā, ba′lā′), *n.* (١) باڵێ؛ سەمای باڵێ.
(٢) تیپی باڵێ؛ سەماکەرانی باڵێ.
**balletomane** (bal′ət-ə-mān′), *n.* حەزکەر لە سەمای باڵێ.
**ballflower** (bôl′flou′ẽr), *n.* گوڵەخڕە (خانووسازی).
**ballista** (bə-lis′tə), *n.* مەنجەنیق؛ بەردو مووشەك هاوێژ (چەکێکی جەنگیی کۆنە)؛ قۆچەقانیی گەورە.
**ballistic** (bə-lis′tik), *adj.* (١) هی گوللەو مووشەك هاویشتن.
(٢) تایبەتی بە بزوان‌و هێزو کارئەنجامی گوللە.
**ballistic missile,** مووشەکی بالیستی؛ مووشەکی دوورهاوێژ.
**ballistics** (bə-lis′tiks), *n.pl.* زانستی تەقاندن‌و بزواندن‌و کارئەنجامی گوللەو مووشەك‌و بۆمبا.
**ballonet** (bal′ə-net′), *n.* باڵۆنی بچووك: دەفرێکی هەوا یا گازە لەناو باڵۆنێکدا پڕ دەکرێت‌و فش دەکرێتەوە بۆ یارمەتیدانی باڵۆنەکە لە هەڵسان‌و نیشتنەوەدا.
**balloon** (bə-lōōn′), *n.* (١) باڵۆن. (٢) میزەڵان.
*v.t.* هەواتێکردن؛ فووتێکردن؛ پەمپ تێکردن‌و ئاوساندن وەك باڵۆن‌و میزەڵان.
*v.i.* (١) گەشتکردن بە باڵۆن؛ بە باڵۆن گەڕان.
(٢) ئاوسان (وەك باڵۆن)؛ زل بوون.
*adj.* باڵۆن ئاسایی؛ خڕو نەرم‌و زل وەك باڵۆن؛ زل.
**balloonist** (bə-lōōn′ist), *n.* (١) باڵۆنەوان؛ فڕۆکەچی باڵۆن.
(٢) سواربووی باڵۆن.
**balloon sail,** بایەوانی باڵۆن: کە یەخت لەگەڵ بایەوانەکەی خۆی یا لەبری بەکاردەهێنێت.
**balloon tire,** تایەیەکی گەورەی پڕ لە هەوایە لەژێر پەستانێکی کەمدا.
**ballot** (bal′ət), *n.* (١) تکتی دەنگدان (لە زوودا تۆپێك لەبری کاغەز بەکاردەهێنرا). (٢) دەنگدان؛ شێوەی دەنگدان (بەتایبەتی هی نهێنی).
(٣) سەرجەمی دەنگی دراو لە دەنگدانێکدا.
(٤) لیستەی پاڵێوراوان یا ناودێرکراوان (دەنگدان).
*v.i.* دەنگدان؛ بڕیاردانی شتێك بە دەنگدان.
**ballot box,** سنووقی دەنگدان.
**ballottement** (bə-lot′mənt), *n.* (١) بۆ دەرکەوتنی سکپڕیی ژن بە پەنجەنان بە منداڵاندا.
(٢) دۆزینەوەی نەخۆشی جگەر بە پەنجەنان بە جگەردا.
**ballplayer** (bôl′plā′ẽr), *n.* یاریکەر بە تۆپ (یاری بێسبۆڵ).
**ball point pen,** قەڵەم پاندانی ووشك.
**ballroom** (bôl′rōōm′, bôl′room′), *n.* هۆڵی سەما.
**ball valve,** تۆپەوانە؛ دەمەوانەی خڕ (کە تەووژمی ئاو بەرزو نزمی دەکاتەوەو کونەکەی پێ دەکاتەوە یا دادەخات).
**ballyhoo** (bal′i-hōō′), *n.* [Colloq.], (١) دەنگەدەنگ؛ هەرا هەرا.
(٢) پڕوپاگەندەی پێ لێ هەڵبڕاوو بەجۆش‌و بە دەنگی بەرز.
*v.t. & v.i.* [Colloq.], پڕوپاگەندەکردن بە گەرمی‌و بە دەنگی بەرز.
**balm** (bäm), *n.* (١) مەلحەم؛ مەلحەمی بۆن خۆش.
(٢) دەرمانی خەم ڕەوێن: *( Sleep was a ~ to his troubles.)* .
(٣) بۆن؛ بۆنێکی خۆش.
(٤) ڕووەکێکی بۆن خۆش (وەك نەعنا، ڕێحانە).
**Balmoral** (bal-môr′əl, bal-mor′əl), *n.* (١) ژێرکراسێکی خوری.
(٢) شەپقەیەکی بێ لێواری ئوسکوتلەندییە.
(٣) [b-]، پێڵاوێکی قەیتانداره.
**balmy** (bäm′i), *adj.* (١) وەك مەلحەم وایە؛ خەم ڕەوێن؛ بۆن خۆش.
(٢) خۆش (ئاووهەوا)؛ نە گەرم‌و نە سارد: *( ~ weather; a ~ breeze)* .
(٣) [British Slang]، شێتۆکە.

**balneal** (bal′ni-əl), *adj.* تایبەتی بە سەرشۆرك؛ هی خۆشتن.

**balneology** (bal′ni-ol′ə-ji), *n.* زانستی خۆشتن لە ئاوی کانزاییداو کەڵکی بۆ تەندروستی

**baloney, boloney** (bə-lō′ni), *n.* (١) bologna .
(٢) [Slang]، قسەی هیچ‌ڕپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ مانا.

*interj.* قسەی هیچ!؛ قسەی هیچ‌ڕپووچ!؛ قسەی قۆڕو بێ مانا!.

**balsa** (bôl′sə, bäl′sə), *n.* (١) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە دارەکەی ڕەق‌و سووکە کەڵەکی لێ درووست دەکرێت. (٢) دارو تەختەی ئەم درەختە.
(٣) کەڵەکێك کە لەم دارە درووستکرابێت.

**balsam** (bôl′səm), *n.* (١) مەڵحەمی بۆن خۆش؛ مەڵحەم؛ بەلسەم.
(٢) بۆنی خۆش؛ عەتر. (٣) دەرمانی خەم ڕەوێن؛ شتی خەم ڕەوێن.
(٤) (ا) دارێکە مەڵحەمی بۆن خۆشی لێ دەردێت.
(ب) ڕووەکێکی بۆن خۆشە؛ ڕووەکێکە بۆنی خۆشی لێ دەردەهێنرێت.

**balsamic** (bôl-sam′ik, bal-sam′ik), *adj.* (١) وەك مەڵحەمی بۆن خۆش وایە؛ بەلسەمی؛ بۆن خۆش. (٢) خەم ڕەوێن؛ دلکەرەوە؛ خۆش.

**Baltic** (bôl′tik), *adj.* بەلتیقی: (ا) تایبەتی بە دەریای بەلتیق.
(ب) تایبەتی بە ووڵاتەکانی بەلتیق (ووشەی داهاتوو ببینە).

*n.* زمانە بەلتیقی‌یەکان.

**Baltic States,** ووڵاتە بەلتیقی‌یەکان (لیتوانیا، لاتڤیا، ئەستۆنیا هەروەها هەندێ جار فنلەندە)

**baluster** (bal′əs-tēr), *n.* ستنگی محاجەرەی پێ پلیکانە؛ نەردە.

**balustrade** (bal′ə-strād′), *n.* محاجەرەی پێ پلیکانە؛ نەردە.

**bambino** (bam-bē′nō), *n.* (١) منداڵ؛ منداڵی ساوا
(٢) وێنەی منداڵی‌ی عیسا.

**bamboo** (bam-bōō′), *n.* (١) قامیش؛ درەختی قامیش.
(٢) دار قامیش؛ قەفە قامیش.

*adj.* (١) وەك قامیش؛ تایبەتی بە قامیش. (٢) لە قامیش درووستکراو.

**bamboozle** (bam-bōō′z'l), *v.t.* [Colloq.], (١) خەڵەتاندن؛ دەستبڕین. (٢) سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێواندن.

**ban** (ban), *v.t.* (١) قەدەغەکردن (شت، کردار)؛ ڕێگەنەدان؛ نەهێشتن:
*( to ~ liquor ; The government ~ned all meetings and demonstrations.)*
(٢) قەدەغەکردن (کەسێك لە کردنی شتێك)؛ دەرکردن.
(٣) [Archaic]. لەعنەت کردن.

*n.* (١) بەیاننامە یا بانگ کردنی پاشا بۆ خەڵك بۆ چەك هەڵگرتن یا بۆ جەنگ (سەدانی ناوەڕاست). (٢) لە کڵێسە دەرکردن؛ سەرزەنشت کردن لەلایەن کڵێسە.
(٣) لەعنەت
(٤) قەدەغە؛ قەدەغەکاری؛ قەدەغەکردن:
*( a ~ on demonstrations, alcoholic beverages, etc.)*

**banal** (bā′n'l, bə-nal′, bə-näl′, ban′'l), *adj.* هیچ‌ڕپووچ؛ بێ بایەخ؛ بێ تام؛ پەڕپووت (ووتە)؛ کۆن‌و سوواو (ووتە):
*( a ~ remark, conversation, statement, etc.)*

**banality** (bə-nal′ə-ti), *n.* (١) هیچ‌ڕپووچی؛ پەڕپووتی (ووتە)
(٢) ووتەیەکی پەڕپووت‌و بێ تام.

**banana** (bə-nan′ə), *n.* مۆز؛ دار مۆز.

**band** (band), *n.* (١) پێبەست (لاستیك، شریت، بەن، تەل)؛ بەند (بۆ پێچانەوە یا قایم کردن): *( watchband ; rubberband )* .
(٢) تیرە (بۆ جوانی یا قایم کردن)؛ سەرپێچ: *( headband, hatband)* .
(٣) تیلماسك؛ تیرە (قوماش). (٤) یەخە.
(٥) (*pl.*)، دوو تیرە قوماشی بارێکە لە ملەوە شۆڕدەبنەوە بەسەر جلدا (جل‌وبەرگی دادوەرو مامۆستای زانکۆ).
(٦) قایشی مەکینەو خولخولۆکە. (٧) [Archaic]، پێوەند؛ تەوق.
(٨) تیلماسکی پەراوێز (خانووسازی).
(٩) مەودای لەرە یا شەپۆلی رادیۆ.

*v.t.* (١) بەستن (تەل، بەن، لاستیك، قایش، شریت، بەن)؛ پێچانەوە.
(٢) ڕازاندنەوە بە تیرەیەك قوماش، دار، یا تەختە.

**band** (band), *n.* (١) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ: *( a ~ of robbers)* .
(٢) تیپ (مۆسیقا): *( a rock-and-roll ~ ; a jazz ~ )* .

*v.i. & v.t.* یەکگرتن؛ بوون بە یەك:
*( to ~ together against a common enemy)*

**bandage** (ban′dij), *n.* برینپێچ؛ سارغی.

*v.i. & v.t.* بە سارغی پێچان؛ پێچان (برین).

**bandanna, bandana** (ban-dan′ə), *n.* دەستەسڕێکی گەورەو ڕەنگاوڕەنگە بە ناوچەوان یا بە سەرەوە دەبەسترێتەوە؛ سرکەیی؛ سەربەست

**bandbox** (band′boks′), *n.* سنووقێکی مقەبایە بۆ یەخەو شەپقە تێخستن.

**bandeau** (ban-dō′, ban′dō), *n.* (١) تیرە قوماش (دەبەسترێت بە ناوچەوانەوە بۆئەوەی قژ نەیەتە ناو چاوەوە). (٢) سوخمەیەکی مەمکی بارێکە.

**banderole, banderol** (ban′də-rōl′), *n.* (١) ئاڵایەکی بارێکە بەسەر ڕم، دار، یا بەلەمێکەوە. (٢) ئاڵایەکی درووشم لەسەر نووسراو.
(٣) ئاڵایەکی بچووکی سەر گۆڕێك یا تەرمێك.

**bandicoot** (ban′di-kōōt′), *n.* مشکێکی گەورەی هیندی کێڵگەیە.

**bandit** (ban′dit), *n.* چەتە؛ جەردە؛ ڕێگر؛ کەسێکی قاچاخ یا یاخی.

**banditry** (ban′di-tri), *n.* چەتەیی؛ جەردەیی.

**banditti** (ban-dit′i), *plural of* **bandit.**

**bandmaster** (band′mas′tēr, band′mäs′tēr), *n.* سەرتیپی- مۆسیقا.

**bandog** (ban′dôg′), *n.* سەگی بەستراوە لەبەر دڕی.

**bandoleer, bandolier** (ban′də-lêr′), *n.* فیشەك لەغ.

**bandoline** (ban′də-lēn′, ban′də-lin), *n.* ڕۆن لەسەردان (بۆ- لوول یا بریقانەوەی قژ).

**bandore** (ban-dôr′, ban′dôr), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی ژێدارە لە گیتار دەچێت.

**band saw,** مشارێکی قایشە لەسەر دوو خولخولۆکە دەخولێتەوە.

**band shell,** سەکۆیەکی دەرەوەی تیپێکی مۆسیقایە دیوارێکی قوپاوی لەپشتەوەیە.

**bandsman** (bandz′mən, banz′mən), *n.* ئەندامی تیپێکی- مۆسیقا.

**bandstand** (band′stand′, ban′stand′), *n.* سەکۆیەکی سەر- گیراوی دەرەوەی تیپێکی مۆسیقا یا ئۆرکێسترایەك.

**bandwagon** (band′wag′n), *n.* عەرەبانەیەکی ڕازاوەیە تیپێکی مۆسیقای لەسەر سوار دەبێت لە خۆپیشاندانێکدا.

on the **bandwagon,** [Colloq.], لەگەڵ دەستەی براوەدایە:
*( to jump on the bandwagon)*

**bandy** (ban′di), *v.t.* (١) یاری پێکردن (وەك تۆپ)؛ ئەم دەست‌و ئەو- دەست پێکردن. (٢) قاوخستنەوە؛ فیتنەبازی کردن؛ قسە هێنان‌و بردن:
*( to ~ a story about)*
(٣) قسە بە یەکتر ووتن؛ ئاڵوگۆڕکردن (قسە لە دەمەقاڵێدا):
*( to ~ words with a person)*

**bandy** (ban′di), *n.* (١) گۆرزی یاری " هۆکی " .
(٢) یاری‌یەکە لە " هۆکی " دەچێت.

*adj.* کەوانەیی؛ چەماوە؛ خوار.

**bandy-legged** (ban′di-leg′id, ban′di-legd′), *adj.* لاق- کەوانەیی؛ لاق چەماوە؛ گەڵ بلاو.

**bane** (bān), *n.* (١) [Poetic]، فەوتان؛ نەمان؛ لەناوچوون.
(٢) فەوتێنەر؛ لەناوبەر؛ هۆی ناخۆشی‌و مەراق:
*( She is the ~ of my life . ; Drink has been the ~ of his life.)*
(٣) ژەهر (تەنها لەم ووشەیەدا: **rat's-bane** ) .

**baneful** (bān′fəl), *adj.* ژەهراوی؛ کوشندە؛ زیانبەخش:
*( the ~ hemlock; a ~ influence)*

**bang** (baŋ), *v.t.* (١) بەتوندی لێدان؛ زرمە لێ هەڵسان؛ پیاکێشان؛
پیامالین: *( He ~ed his fist on the table.)* .
(٢) بەتوند داخستن؛ تەقە لێ هەڵسان: *( to ~ a door, window, etc.)* .
(٣) تەقەتەق پێکردن: *( to ~ the dishes in the sink)* .
(٤) [Vulgar Slang]، لەگەڵ جووت بوون؛ گاین.
*v.i.* (١) تەقین؛ تەقینەوە: *( Firecrackers ~ .)* .
(٢) خۆ لێدان؛ پیاکێشان؛ بە قایمی لێدان: *( He ~ed into the wall.)* .
*n.* (١) زرمە؛ تەپە.
(٢) تەقە؛ تەقینەوە: *( The gun went off with a ~ .)*
(٣) [Slang]، خۆشی کوتوپڕ (وەك ناوهاتنەوە).
*adv.* (١) بەقایمی؛ بەتوندیو بە دەنگی زل. (٢) بە دەنگی بەرزو کوتوپڕ.
*interj.* دەنگێك وەك هی تەقە یا تەقینەوە.
**bang** (baŋ), *v.t.* تاشینی قژی سەر ناوچەوان بەڕێکی.
*n.pl.* پەرچەم؛ قژی سەر ناوچەوانی ڕێك بڕاو (کە هاتبێتە خوارەوە هەتا
نزیك برۆ).
**bangle** (baŋ'g'l), *n.* بازنە؛ پارانە
**Bang's discase,** درمێکی ڕەشەوولاخە دەبێتە هۆی بەراویتەبوون.
**bang-up** (baŋ'up'), *adj.* [Slang]. نایاب؛ زۆر چاك
**banian** (ban'yən), *n.* (١) بانیان: بازرگانێکی هیندی گۆشت نەخۆرە
(٢) کراس یا بزداشەیەکی دەڵبی هیندی‌یە
**banish** (ban'ish), *v.t.* (١) دەرکردن (لە وولات یا شار)؛ شاربەدەرکردن؛
ئاوارەکردن (٢) دوورخستنەوە؛ دەرکردن
(٣) لە بیری خۆ بردنەوە؛ لە مێشك لادان.
**banishment** (ban'ish-mənt), *n.* (١) دەرکردن (لە وولات یا شار)؛
شاربەدەرکردن. (٢) دەرکردن؛ دوورخستنەوە.
**banister, bannister** (ban'is-tēr), *n.* (١) سنگی محاجەرەی-
پێ پلیکانە (٢) ( *pl.* )، محاجەرەی پێ پلیکانە؛ نەردە
**banjo** (ban'jō), *n.* بانجۆ: ئامێرێکی مۆسیقایی ژێدارە.
**-banjoist** *(n.)*.
**bank** (baŋk), *n.* (١) بانق (٢) خانووی بانق.
(٣) ئەو سنووقەی قومارگێڕ پارەی تێ دەخات؛ ئەم پارەیە.
(٤) (أ) بانقی خوێنو ئەندامی لەش بۆ دانی بە نەخۆش لەکاتی پێویستیدا
(پزیشکەوانی): *( a blood ~ ; an eye ~ )* .
(ب) بانقی زانیاری *( a data ~ )* .
*v.i.* (١) پارە خستنە بانقەوە؛ ئاڵوویرکردن لەگەڵ بانقدا.
(٢) بەڕێوەبردنی بانق. (٣) چاودێری کردنی بانقی قومار، واتە ئەو سنووقەی
قومارگێڕ پارەی تێ دەخات.
*v.t.* پارە خستنە بانقەوە.
**bank on,** [Colloq.]. پشت پێ بەستن؛ بەتەمابوون
*( Don't bank on his help.)*
**bank** (baŋk), *n.* (١) پەڵەیەکی درێژکۆلە (هەور)؛ گردۆلکەیەکی درێژکۆلە؛
تۆپەڵ. (٢) قەدپاڵ؛ گرد (٣) بەستوو
(٤) ( *pl.* )، کەنار (دەریا، ڕووبار، جۆگە)؛ ڕۆخ؛ قەراغ؛ گوێ؛ لێوار:
*( along the river ~ )*
(٥) بەرزایی زەمینەی دەریاو دەریاچە؛ تەنکایی (دەریاچە، ئەستێل).
(٦) لێواری ئاوەوەی مێزی بلیارد
(٧) بەلادا خواربوونەوەی فڕۆکە لەکاتی پێچکردنەوەدا
*v.t.* (١) بەستوو بەدەوردا درووستکردن
(٢) کۆمەڵ کردن؛ کۆکردنەوە؛ خڕکردنەوە *( to ~ earth along a wall)* .
(٣) ئاگر خۆش کردن
(٤) وەك بەرەوژوورکە لێکردن (ڕێگە)؛ کووڕکردنەوە
(٥) لێدانی تۆپی بلیارد بەجۆرێك کە لە لێواری مێزەکە بداتو بگەڕێتەوە.
(٦) بەلاداخستن یا لارکردنەوەی فڕۆکەیەك لەکاتی فڕیندا
*v.i.* (١) وەك بەستوو لێهاتن؛ تۆپەڵ بوون بە درێژکۆلەیی؛ گردبوونەوە.
(٢) لارکردنەوەی فڕۆکەیەك لەکاتی فڕیندا.

**bank** (baŋk), *n.* (١) تەختی دانیشتنی سەوڵ لێدەران لە بەلەمێکی
سەوڵدا. (٢) ڕیزە سەوڵ. (٣) ڕیز.
(٤) ڕیزە کلیل (بە تەختەی کلیلەوە بەسەر دیوارێکەوە).
*v.t.* ڕیزکردن.
**bankable** (baŋk'ə-b'l), *adj.* بانق وەری دەگرێت؛
دەگۆڕرێتەوە لە بانقدا.
**bank account,** حسابی بانق (هی کەسێك یا کۆمپانیایەك).
**bank bill,** بانقەنۆت؛ حەواڵە یا چەکی بانقی (لە بانقێکەوە بۆ بانقێکی تر).
**bankbook** (baŋk'book'), *n.* دەفتەری بانق: دەفتەرێکی بچووکە کە
کەسێك حسابی بانقی خۆی تێدا ڕادەگرێت (هەروەها " passbook ") .
**bank discount,** سوودی لێدەرکراو: سوودی ئەو قەرزەیە کە بانق
دەیدات بە کەسێكو پێشەکی لە قەرزەکەی دەریدەکاتو هەڵی دەگرێت.
**bank draft,** بانقەنۆت: حەواڵەیەکە لە بانقێکەوە بۆ بانقێکی تر.
**banker** (baŋk'ẽr), *n.* (١) خاوەن بانق؛ بەڕێوەبەری بانق.
(٢) چاودێری پارە یا بانقی قومارێك.
**banker** (baŋk'ẽr), *n.* ماسیگر؛ کەشتی ڕاوەماسی.
**bank holiday,** پشووی بانق.
**banking** (baŋk'iŋ), *n.* بانقچێتی؛ کاروباری بانق.
**bank note,** بانقەنۆت: چەکێکە بانقێك دەریدەکات دەتوانرێ لە هەموو
بانقێکی تردا بگۆڕرێتەوە؛ حەواڵەیەکە لە بانقێکەوە بۆ بانقێکی تر.
**bankrupt** (baŋk'rupt, baŋk'rəpt), *n.* (١) کەسێکی مایەپووچ یا
نابووت. (٢) کەسێك کە نەتوانێت قەرزەکانی بداتەوە.
(٣) کەسێك کە شتێکی نەبێت: *( a mental ~ )* .
*adj.* (١) مایەپووچ؛ مایەپووت؛ نابووت.
(٢) نەبوو؛ نابووت (مەجاز): *( He is morally ~ .)* .
*v.t.* مایەپووچ کردن؛ نابووت کردن.
**bankruptcy** (baŋk'rupt-si, baŋk'rəp-si), *n.* مایەپووچی؛
مایەپووتی؛ نابووتی.
**banner** (ban'ẽr), *n.* (١) ئاڵا؛ بەیداخ.
(٢) درووشم: *( the ~ of freedom)* .
(٣) سەردێڕی ڕۆژنامە (کە لەسەری لاپەڕەکە بۆ ئەوسەری بگرێتەوە).
*adj.* زۆرباش؛ نایاب: *( a ~ year for wheat)* .
**banneret, bannerettc** (ban ẽr-et'), *n.* ئالایەکی بچووك.
**banneret** (ban'ẽr-it, ban ẽr-ct'), *n.* (١) سەرەك سوارچاك.
(٢) پلەیەکی سوارچاکی‌یە.
**bannerol** (ban'ẽr-ōl'), *n.* = **banderole.**
**bannister** (ban'is-tēr), *n.* = **banister.**
**banns, bans** (banz), *n.pl.* جاڕدانی نیازی ژنهێنانو شووکردن لە
کڵێسەدا.
**banquet** (baŋ'kwit, ban'kwit), *n.* (١) ژەمێك خواردنی نایاب؛
خوانی ڕازاوە. (٢) ئاهەنگی ڕەسمی نان خواردن.
*v.t.* بانگ کردن بۆ شێوی ڕەسمی؛ ئاهەنگی سەرخوان بۆ گێڕان.
*v.i.* خواردنی خۆش خواردن.
**banquette** (baŋ-ket'), *n.* (١) سەکۆی ناو سەنگەر (بۆ تەقەکردن).
(٢) شۆستە. (٣) کورسی‌یەکی درێژی دۆشەك لەسەرە بە قەراغ دیواری
چێشتخانەیەکدا.
**banshee, banshie** (ban'shē, ban-shē'), *n.* خێوێکی مێینەی
بەدوومە وەك بایەقووش بەسەر ماڵدا دەخوێنێتو نوقڵانەی مردن لێدەدات
(فۆلکلۆری ئێرلەندەو ئوسکوتلەندە)؛ کەسێکی بەدووم.
**bantam** (ban'təm), *n.* (١) [B-]، باڵندەیەکی بچووکە لە مریشك
دەچێت. (٢) کەسێکی بچووکی شەڕەنگێز.
(٣) بۆکسباز یا زۆرانبازێکی سووك کە قورسایی‌یەکەی لەنێوان (١١٢-١١٨)
پاوەندا بێت.
*adj.* بچووكو شەڕەنگێز.
**bantamweight** (ban'təm-wāt'), *n.* زۆرانباز یا بۆکسبازێکی

بچووك و سووك كه قورسایییه‌كه‌ی له‌نێوان (١١٢–١١٨) پاوه‌ندا بێت.

**adj.** تایبه‌تی به زۆرانباز یا بۆكسبازێكی بچووك و سووك.

**banter** (ban'tẽr), *v.t.* گاڵته‌وگه‌پ كردن؛ گاڵته‌پێكردن (له‌رووی براده‌رایه‌تییه‌وه)؛ كلك پێوه‌كردن؛ توانج تێگرتن.

*v.i.* ( ~ with ), گاڵته‌وگه‌پ له‌گه‌ڵ كردن؛ كلك پێوه‌كردن.

*n.* گاڵته‌وگه‌پ؛ كلك پێوه‌كردن؛ توانج.

-banterer *(n.)*; banteringly *(adv.)*.

**bantling** (bant'liŋ), *n.* منداڵ (به‌تایبه‌تی هی زۆرزان یا هاروهاج).

**banyan** (ban'yən), *n.* دارهه‌نجیرێكی هیندییه لقه‌كانی ره‌گ داده‌كوتن و ده‌بنه دره‌ختی تازه.

**banzai** (bän'zä'ī, bän'zī'), *n.* بانگه‌وازێكی جه‌نگیی یاپانییه به‌مانای: خوابكه‌م ده هه‌زار ساڵ بژیت!

**banzai attack, banzai charge,** هێرشێكی خۆكوژانه‌یه سه‌ربازه یاپانییه‌كان ئه‌نجامیان ده‌دا له جه‌نگی جیهانیی دووه‌مدا.

**baptism** (bap'tiz'm), *n.* (١) پیرۆزكردنی منداڵ به هه‌ڵكێشانی له ناو (خاچ په‌رستی) (٢) یه‌كه‌م تاقیكردنه‌وه؛ تاقیكردنه‌وه‌یه‌كی گران.

-baptismal *(adj.)*.

**baptism of fire,** (١) جه‌نگی یه‌كه‌می تازه سه‌رباز.

(٢) تاقیكردنه‌وه‌یه‌كی گران.

**Baptist** (bap'tist), *n.* (١) [b-] ، كه‌سێك كه منداڵ پیرۆز ده‌كات به هه‌ڵكێشانی له ناو. (٢) باپتیست: ئه‌ندامی لقێك له لقه‌كانی خاچ په‌رستی پرۆتستانته كه ده‌ڵێت: له ناو هه‌ڵكێشان و پیرۆزكردن ده‌بێت دوای ته‌مه‌نی باڵق بوون بكرێت به منداڵی.

**baptistery** (bap'tis-tri, bap'tis-tẽr-i), *n.* (١) شوێنی له ناو هه‌ڵكێشان یا ناو لێ هه‌ڵپرژاندنی منداڵ و پیرۆزكردنی (خاچ په‌رستی).

(٢) ده‌فری ئه‌م ناوه.

**baptistry** (bap'tis-tri), *n.* = baptistery.

**baptize** (bap-tīz', bap'tīz), *v.t.* (١) له ناو هه‌ڵكێشان و پیرۆزكردنی منداڵ (خاچ په‌رستی) (٢) پاكردنه‌وه؛ خاوێن كردن.

(٣) ناولێنانی منداڵ یا كه‌سێك پاش بوونی به خاچ په‌رست.

**bar** (bär), *n.* (١) شیش (كانزا، دار)؛ شیش (په‌نجه‌ره، ده‌رگا).

(٢) قاڵبی لاكێشه‌یی (سابوون، شیرینی).

(٣) كۆسپ: *( illiteracy is a ~ to success.)* .

(٤) هێڵ؛ میل؛ تیره.

(٥) (ا) جێی دانیشتنی دادپرس یا پارێزه‌ر له ژووری دادگادا.

(ب) قه‌فه‌زی گومانبار

(٦) دادگا (٧) جێی لێپرسینه‌وه. (٨) پارێزه‌ران؛ ده‌سته‌ی پارێزه‌ران.

(٩) پارێزه‌ری؛ پیشه‌ی پارێزه‌ری. (١٠) بار؛ مه‌یخانه.

(١١) مێزی بار كه خه‌ڵك به‌ده‌وریدا داده‌نیشن (مه‌یخانه، چێشتخانه).

(١٢) لغاو (١٣) میلێك یا هێڵێكی ئاسۆیی سه‌ر قه‌ڵغان.

(١٤) به‌تاڵكردنه‌وه‌ی داوایه‌ك (دادگه‌ری). (١٥) قه‌راغی سم یا پاشووی ئه‌سپ.

*v.t.* (١) كڵۆون دان؛ شیش خستنه به‌ر ده‌رگا یا په‌نجه‌ره.

(٢) رێ لێگرتن؛ رێگه داخستن به شیش یا دار.

(٣) قه‌ده‌غه‌كردن؛ نه‌هێشتن؛ رێگه پێ نه‌دان:

*( He was ~red from the contest.)*

(٤) میل میل كردن.

(٥) رێگه‌گرتن له داوایه‌ك (دادگه‌ری).

***prep.*** جگه له *( It's the best hotel in town, ~ none.)* .

**cross the bar,** مردن؛ كۆچی دوایی كردن.

**barb** (bärb), *n.* (١) ریش و سمێڵی هه‌ندێك گیاندار.

(٢) سه‌رپۆش (وشكه‌سۆفی ژنی خاچ په‌رستان).

(٣) قولاپی ماسی گرتن؛ قولاپ.

(٤) توانجێكی توندوتیژ.

(٥) توندوتیژی (ووته)؛ تیژی؛ بڕی: *( the ~ of his wit)* .

(٦) ده‌مارێكی په‌ڕی باڵنده.

(٧) (ا) قه‌ڵاس (گه‌نم و جۆ و رووه‌كی تر). (ب) چوقوڵ؛ درك.

*v.t.* قولاپ پێوه‌كردن؛ قولاپ خستنه‌سه‌ر؛ قولاپ لێدان.

**barb** (bärb), *n.* (١) جۆره ئه‌سپێكی به ره‌گه‌ز عه‌ره‌بییه به خێرایی و به‌هێزی و هێمنی ناسراوه. (٢) جۆره كۆترێكه.

**barbarian** (bär-bâr'i-ən, bär-bâr'yən), *n.* (١) بێگانه؛ كه‌سێكی بێگانه. (٢) كه‌سێكی كێوی و هیچ نه‌زان.

(٣) كه‌سێكی بێ ئه‌زاكه‌ت و كه‌رتی.

(٤) كه‌سێكی دڕنده و بێ به‌زه‌یی.

*adj.* (١) كێوی؛ هیچ نه‌زان. (٢) كه‌رتی؛ بێ ئه‌زاكه‌ت. (٣) دڕنده؛ بێ به‌زه‌یی.

**barbaric** (bär-bar'ik), *adj.* (١) كێوی. (٢) دڕنده.

(٣) بێ تام و له‌ئه‌ندازه به‌ده‌ر (شێواز، رازاندنه‌وه).

**barbarism** (bär'bə-riz'm), *n.* (١) به هه‌ڵه زمان به‌كارهێنان؛ زمان نه‌زانین. (٢) ووشه‌یه‌كی به هه‌ڵه به‌كارهێنراو. (٣) كێویتی.

(٤) كرده‌وه‌یه‌ك یا ره‌وشتێكی ناشرین و دڕندانه. (٥) دڕنده‌یه‌تی.

**barbarity** (bär-bar'ə-ti), *n.* (١) دڕنده‌یه‌تی؛ دڵڕه‌قی؛ نامرۆڤایه‌تی:

*( The bombing of towns and villages is an example of modern ~ .)*

(٢) كارێكی دڕندانه.

(٣) شێوازێكی بێ تام و ناپه‌سه‌ند.

(٤) ووشه‌یه‌كی به هه‌ڵه به‌كارهێنراو.

**barbarize** (bär'bə-rīz'), *v.t.* (١) ووشه و زمان به هه‌ڵه به‌كارهێنان.

(٢) دڕنده‌كردن.

*v.i.* وه‌ك دڕنده لێهاتن.

**barbarous** (bär'bə-rəs), *adj.* (١) بێگانه.

(٢) پڕ له هه‌ڵه (زمان). (٣) كێوی؛ نه‌زان.

(٤) ناشرین (ره‌ووشت، شێوان). (٥) دڕنده؛ دڵڕه‌ق.

(٦) گڕ (ده‌نگ).

**Barbary ape,** مه‌یموونی بێ كلك.

**barbate** (bär'bāt), *adj.* (١) ریشدار. (٢) قه‌ڵاسدار (دانه‌وێڵه).

**barbecue** (bär'bə-kū'), *n.* (١) ئاگردانێكی به‌رز یا مقه‌ڵی گۆشت برژاندن له ده‌ره‌وه‌ی ماڵ. (٢) بریانی، پارێن، گا، به‌ران، یا مه‌ڕێكی به‌یه‌ك پارچه برژێنراو له‌سه‌ر ئاگری ده‌ره‌وه‌ی ماڵ یا حه‌وشه.

(٣) گۆشتی برژاو (به‌تایبه‌تی له‌سه‌ر ئاگری ده‌ره‌وه‌ی ماڵ یا حه‌وشه).

(٤) سه‌یرانی گۆشت برژاندن. (٥) چێشتخانه‌ی گۆشت برژاندن؛ كه‌بابخانه.

*v.t.* (١) كردن به بریانی؛ برژاندنی یه‌ك پارچه‌یی پارێن، مه‌ڕ، یا به‌رازێك.

(٢) گۆشت برژاندن؛ ماسی برژاندن.

*adj.* (١) برژاو (گۆشت)؛ برژێنراو. (٢) تایبه‌تی به گۆشتی برژاو.

**barbecue sauce,** خۆشاوی به‌هارات كه گۆشتی تێ ده‌خرێت و داده‌نرێت پێش برژاندنی.

**barbed** (bärbd), *adj.* (١) دركاوی؛ دركدار.

(٢) بڕ؛ تیژ؛ دركاوی (مه‌جاز): *( ~ words)* .

**barbed wire,** ته‌لی دركاوی؛ ته‌لبه‌ن.

**barbel** (bär'b'l), *n.* (١) تووكێكه به لێوی ماسییه‌وه شۆڕبووه‌ته‌وه (بۆ هه‌ستكردنه). (٢) جۆره ماسییه‌كی گه‌وره‌ی ناو رووباره ئه‌م جۆره تووكه به لێویه‌وه‌یه‌تی.

**barbellate** (bär'bə-lāt', bär'bel'it), *adj.* دركاوی (رووه‌ك)؛ به تووكی وه‌ك درك داپۆشراوه.

**barber** (bär'bẽr), *n.* سه‌رتاش؛ ده‌لاك.

*v.t.* سه‌رتاشین؛ قژتاشین.

**barber college,** قوتابخانه‌ی سه‌رتاشی.

**barber pole,** لووله‌كێكی ره‌نگاوره‌نگی خووڵاوه‌یه له‌به‌رده‌می- سه‌رتاشخانه‌دا.

**barberry** (bär'ber'i, bär'bẽr-i), *n.* (١) رووه‌كێكی گوڵ زه‌رده دركاوییه به‌ری وه‌ك تووترك ده‌گرێت. (٢) به‌ری ئه‌م رووه‌كه.

**barbershop** (bär'bẽr-shop'), *n.* سه‌رتاشخانه؛ ده‌لاكخانه.

**barbet** (bär′bit), *n.* (۱) جۆرە سەگێکی بچووکی تووك لوولە.
(۲) باڵندەیەکی ناوچە گەرمەکانە تووکی وەك دڕك بە بن دەنووکەکەیەوەیەتی.
**barbette** (bär-bet′), *n.* (۱) بەرزاییەکی ناو قەڵایەکە تەقەی لێوە دەکرێت (۲) سەنگەری ناو کەشتییەکی جەنگیی.
**barbican** (bär′bi-kən), *n.* سەنگەر یا قوللەی پاراستنی شارێك یا قەڵایەکە کە لەبەردەمی شارەکە یا قەڵاکەدایە.
**barbital** (bär′bi-tal, bär′bit-əl), *n.* دەرمانێکی نووستنە لەشێوەی تۆزدایە
**barbiturate** (bär′bə-tyoor′it, bär-bich′ēr-it), *n.* دەرمانی ئازار؛ دەرمانی ئازارکوژ
**barbule** (bär′būl), *n.* تووکی پەڕی باڵندە؛ دەمارۆچکەی پەڕ.
**bard** (bärd), *n.* (۱) شایەر (۲) [Poetic]، هۆنەر؛ شاعیر.
**-bardic** *(adj.).*
**bard, barde** (bärd), *n.* زرێی ئەسپ.
*v.t.* زرێ لە ئەسپ کردن
**bare** (bâr), *adj.* (۱) ڕووت؛ پەتی (قاچ)؛ ڕووت‌وقووت. (۲) بەرەڵا.
(۳) دڕاو (جل‌وبەرگ)
(٤) ڕووت‌وقووت؛ ڕووتەنی؛ خاڵی (ژوور، خانوو): *( a ~ room)*.
(٥) سادە؛ بەبێ پێوەنان یا زیادە؛ ڕووت: *( ~ facts)*.
(٦) تەنها *( the ~ necessities of life)*.
*v.t.* ڕووت کردن؛ هەڵماڵین؛ ڕووت‌وقووت کردنەوە؛ ئاشکراکردن (نهێنی)؛ خستنەڕوو
**lay bare,** هەڵماڵین؛ پیشاندان؛ خستنە بەرچاو؛ ئاشکراکردن (نهێنی).
**bareback** (bâr′bak′), *adv. & adj.* بە پشتی ڕووت (سواربوونی ئەسپ)؛ بەبێ زین *( to ride ~ )*
**barefaced** (bâr′fāst′), *adj.* (۱) دەم‌وچاو ڕووت؛ ڕوو هەڵماڵراو
(۲) ئاشکرا؛ کراوە (۳) بێ شەرم؛ بێ ئابڕوو.
**barefoot** (bâr′foot′), *adj. & adv.* پێ پەتی؛ بە پێی پەتی.
**barefooted** (bâr′foot′id), *adj.* = **barefoot.**
**barège** (ba′rezh′), *n.* قوماشی پەچە.
**barehanded** (bâr′han′did), *adj. & adv.* (۱) بە دەستی ڕووت، واتە بەبێ دەستکێش (۲) بە دەستی ڕووت، واتە بەبێ چەك یا ئامێر.
(۳) [Colloq.]، بە تاوانەوە گیراو
**bareheaded** (bâr′hed′id), *adj. & adv.* سەر ڕووت؛ بە سەری ڕووت.
**barelegged** (bâr′leg′id, bâr′legd′), *adj. & adv.* لاق- هەڵماڵراو؛ بە لاقی ڕووت؛ بێ گۆرەوی
**barely** (bâr′li), *adv.* (۱) بە ئاشکرا. (۲) بە ڕووتی؛ بە ڕووت‌وقووتی.
(۳) بە ئاستەم؛ بە حاڵ: *( He ~ escaped injury.)*.
(٤) کەم. (٥) [Archaic]. تەنها
**barfly** (bär′flī′), *n.* عەرەق خۆرێك کە زۆر دەچێتە مەیخانە
**bargain** (bär′g′n, bär′gin), *n.* (۱) سەوداگەریی؛ ڕێکەوتن (کڕین‌و فرۆشتن‌و ئاڵوگۆڕکردن) (۲) مەرجەکانی ڕێکەوتنێك
(۳) ڕێکەوتنێك کە لە سوودی کڕیار بێت؛ کڕینی شتێك بە هەرزان:
*( He bought the suit at a ~ .)*
*v.i.* (۱) سەوداکردن؛ سەوداگەری کردن. (۲) ڕێکەوتن؛ پەیمان بەستن
*v.t.* ئاڵوگۆڕکردن؛ گۆڕینەوە.
**a bad bargain,** سەوداگەرییەکی خراپ؛ ڕێکەوتنێکی خراپ.
**a good bargain,** سەوداگەرییەکی باش؛ ڕێکەوتنێکی باش.
**bargain for,** هەوڵدان بۆ دەسکەوتن بە هەرزان؛ سەوداکردن بۆ بە هەرزان کڕین.
**strike a bargain,** (۱) ڕێکەوتن (کڕین‌و فرۆشتن)
(۲) بە هەرزان شتێك دەسکەوتن؛ شتێك کڕین بە هەرزان.
**-bargainer** *(n.).*
**barge** (bärj), *n.* (۱) دوبە؛ قەیاغ؛ بەلەمی بار.
(۲) بەلەمێکی گەورەی گەشت‌و ئاهەنگی ڕەسمی.
(۳) خانە بەلەم؛ ماڵە بەلەم: بەلەمی تێدا ژیان وەك ماڵ.
(٤) [Slang]، بەلەمێکی ناقۆڵا.
*v.t.* گواستنەوە بە دوبە یا بەلەمی بار.
*v.i.* (۱) بەمێواشی ڕۆیشتن.
(۲) (أ) [Colloq.]، ( ~ in ; ~ into )، خۆتێهەڵقورتان:
*( Don't ~ in our conversation.)*
(ب) ( ~ in )، بە ناشرینانەو لەپڕتاو خۆکردن بە ژووردا:
*( He ~d into the room.)*
(۳) [Colloq.]، ( ~ into )، خۆ پیادان.
**bargee** (bär-jē′), *n.* [British], = **bargeman.**
**bargeman** (bärj′mən), *n.* کەشتییەوانی کەشتی بارگواستنەوە.
**baric** (bar′ik), *adj.* [Rare], تایبەتی بە باریۆم.
**baric** (bar′ik), *adj.* بارۆمەتری؛ تایبەتی بە پەستانێو.
**baritone** (bar′ə-tōn′), *n.* (۱) دەنگی نێرینەی مام ناوەندی لە بەرزیو نزمیدا (گۆرانی). (۲) گۆرانی بێژێك بەم جۆرە دەنگەوە.
(۳) ئامێرێکی مۆسیقایی ئەم جۆرە دەنگە.
**barium** (bâr′i-əm), *n.* باریۆم.
**bark** (bärk), *n.* توێکڵەدار.
*v.t.* (۱) بە توێکڵ خۆش کردن (پێستە). (۲) توێکڵ لێکردنەوە؛ ڕووت کردن.
(۳) [Colloq.]، پێست داماڵین.
**bark** (bärk), *v.i.* (۱) وەڕین؛ حەپین.
(۲) بە ناشرینانە قسەکردن (وەك وەڕەی سەگ). (۳) [Colloq.]، کۆکەکردن.
(٤) [Slang]، جاڕدان بە دەنگی بەرزو ناساز.
*n.* وەڕە؛ حەپە؛ سەگوەڕ.
**bark at the moon,** بە مانگ وەڕین؛ ناڕەزایی بێ سوود دەربڕین.
**bark up the wrong tree,** (۱) هێرش بردنە سەر شتێك بە هەڵە؛ بە هەڵەدا چوون. (۲) هەوڵدان بە هەڵە؛ هەوڵی بێ سوود دان.
**bark** (bärk), *n.* [Poetic], بەلەمێکی بایەوانی بچووکە.
**barkeeper** (bär′kēp′ēr), *n.* مەیخانەچی.
**barker** (bär′kēr), *n.* (۱) وەڕیو (سەگ، مرۆڤ).
(۲) کەسێك کە لەبەردەمی فرۆشگا یا تیاترۆیەکدا بە دەنگی بەرز کڕیار ڕادەکێشێت.
**barker** (bär′kēr), *n.* توێکڵ لە دار کەرەوە (مرۆڤ، مەکینە).
**barley** (bär′li), *n.* جۆ.
**barleycorn** (bär′li-kôrn′), *n.* (۱) دەنکە جۆ؛ جۆ.
(۲) پێوانەیەکی کۆنە بریتییە لە سێ‌یەکی ئینجێك.
(۳) خواردنەوەی کحولی (بەتایبەتی ویسکی).
**barley sugar,** نوقوڵێکە لە شەکری تواوەو ئاوی جۆ دروست دەکرێت.
**barm** (bärm), *n.* کەفی بیرە؛ کەفی سەر بیرە لەکاتی ترشانیدا.
**barmaid** (bär′mād′), *n.* ئافرەتی مەیگێڕ لە مەیخانەدا.
**barman** (bär′mən), *n.* پیاوی مەیگێڕ لە مەیخانەدا.
**barmy** (bär′mi), *adj.* (۱) کەفاو (بیرە)؛ کەفدار.
(۲) [British Slang]، شێتۆکە؛ شێت.
**barn** (bärn), *n.* (۱) تەویلە؛ کایەن؛ کایەن‌و تەویلە.
(۲) گەراجی پاسی ناوشار. (۳) [Colloq.]، ژوور؛ خانە.
**barnacle** (bär′nə-k′l), *n.* (۱) گیاندارێکی بچووکی قاوغدارە بە بەردەوە دەنووسێت ئەوەندەی گوێزێك دەبێت. (۲) جۆرە قازێکی کێوییە.
(۳) [Colloq.]، کەسێکە کە پێتەوە نووسا لێت نابێتەوە.
**barnacles** (bär′nə-k′lz), *n.pl.* (۱) لەواشە (کە دەکرێتە لمۆزی وڵاخی سرك لەکاتی ناڵ کردنیدا). (۲) ئامێرێکی ئازاردانە لە لەواشە دەچێت.
(۳) [British Slang]، چاویلکە.
**barn dance,** (۱) سەمایەکی لادێییانەی ئەمریکییە.
(۲) ئاهەنگێکی سەمای ناو کایەنە.
**barn owl,** کونەپەپووی ناو کلۆری دارو کایەن.

**barnstorm** (bärn′stôrm′), *v.i.* (١) گەڕان بە لادێو شارۆچکەداو ووتاری رامیاری دان یا شانۆگەری پێشکەش کردن.
(٢) خوێنواندن بە فڕۆکەو خۆفڕێدان بە پەڕەشووت لە پێشانگادا.
**barnyard** (bärn′yärd′), *n.* حەوشەی دەوروپشتی کایەن و تەویلە.
**baro-** (bar′ō, bar′ə), پێشگرێکە بەمانای: تایبەتی بە پەستانی هەوا.
**barogram** (bar′ə-gram′), *n.* بارۆگرام: تۆمارکراوەی پەستانپێوی ئۆتۆماتیکی.
**barograph** (bar′ə-graf′, bar′ə-gräf′), *n.* بارۆگراف: پەستان– پێوی ئۆتۆماتیکی هەوا.
**barometer** (bə-rom′ə-tẽr), *n.* (١) بارۆمەتر؛ پەستانپێو.
(٢) پێوەری گۆڕین؛ نیشانەکەر؛ شتێك کە گۆڕینی رامیاری، کۆمەلایەتی، ئابووری یا کلتووری پێشان بدات.
**-barometric** *(adj.)*; **barometrically** *(adv.)*.
**baron** (bar′ən), *n.* (١) بارۆن. بەگزادەیەکی ئینگلیز یا ئەورووپایییە.
(٢) سەرمایەدارێکی بەدەسەلات.
**baronage** (bar′ən-ij), *n.* (١) چینی بارۆنەکان؛ نزمترین چینی بەگزادەی ئینگلیز.
(٢) پلەوپایەو دەسەلات و ناوچەی ژێردەستی بەگزادەیەکی ئەم چینە.
(٣) بەگزادەکان. (٤) لیستەی ناوی بەگزادە.
**baroness** (bar′ə-nis), *n.* (١) ژنی بارۆن. (٢) بارۆن (ژن)؛ خاتووزادە.
**baronet** (bar′ə-nit, bar′ə-net′), *n.* (١) بەگزادەیەکی ئینگلیزە کە پلەی لەخوار " بارۆن " موەیەو لەسەروو " شاسوار " موەیە.
(٢) پلەوپایەی ئەم بەگزادەیە.
**baronetage** (bar′ə-nit-ij), *n.* لیستەی ناوو پلەوپایەی " بارۆنێت " (ووشەی پێشوو ببینە).
**baronetcy** (bar′ə-nit-si), *n.* پلەوپایەو دەسەلاتی " بارۆنێت ".
**baronial** (bə-rō′ni-əl), *adj.* (١) بارۆنی؛ بەگزادەیی.
(٢) بۆ بەگزادە دەشێت: *( a ~ mansion)*.
**barony** (bar′ə-ni), *n.* (١) ناوچەی ژێردەستی بارۆنێك.
(٢) پلەوپایەی بارۆن.
**baroque** (bə-rōk′), *adj.* (١) نارێك. شێوان.
(٢) زۆر رازاوەو مێلی کەوانەیی و خواروخێچاویدار (خانووسازی، هونەر).
(٣) تایبەتی بە چەرخی ئەم جۆرە هونەرە (سەدەی شانزەو حەڤدەو هەژدە).
(٤) لە ئاەو ئەندازە بەدەر رازاوە.
*n.* شێوازێکی هونەری و خانووسازییە بریتییە لە ڕازاندنەوەو مێلی کەوانەیی و خواروخێچی ئێجگار زۆر.
**baroscope** (bar′ə-skōp′), *n.* ئامێری پێوانی گۆڕانی پەستانی هەوا.
**barouche** (bə-rōōsh′), *n.* عەرەبانەیەکی سەرپێچراوەی چوار– کورسییە
**barque** (bärk), *n.* بەلەمی با. کەشتی با.
**barquentine** (bär′kən-tēn′), *n.* = **barque.**
**barrack** (bar′ək), *n.* (١) [Rare] ، کوختە.
(٢) *(pl.)*، ئۆردووگا؛ سەربازگە.
(٣) *(pl.)*، نیشتەجێیەکی کاتی کرێکاران.
***v.t. & v.i.*** حەواندنەوە یا دانان لە ئۆردووگادا؛ خستنە سەربازگەوە؛ نیشتەجێ بوون لە ئۆردووگادا.
**barracuda** (bar′ə-kōō′də), *n.* جۆرە ماسییەکی گەورەو دڕندەی دەریاییە.
**barrage** (bə-räzh′), *n.* (١) بۆمباران کردنێك بە گوللە تۆپ بۆ ڕێگرتن لە هێزی دوژمن یا پاراستنی هێزی خۆ لەکاتی هێرش بردندا؛ دەسرێژ.
(٢) لێشاو (ووتە، پرسیار، مستەکۆڵە): *( a ~ of questions)*.
***v.t. & v.i.*** دەسرێژکردن؛ دەسرێژلێکردن.
**barrage** (bär′ij), *n.* (١) بەنداو؛ بەست. (٢) کۆسپ.
**barranca** (bə-raŋ′kə), *n.* دۆڵێکی قووڵ: چەمێکی قووڵ.
**barratry** (bar′ə-tri), *n.* (١) کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەو هەروەها کاربەدەستێتی لە میری و کڵێسەدا؛ بە بەرتیل فەرمانبەرێتی پێدان.
(٢) زوو زوو شەڕنانەوە؛ زوو زوو بەخۆڕایی شکات کردن.
(٣) کەمتەرخەمی یا ساختەبازی کەشتییەوان.
**-barrator, barrater** *(n.)*; **barratrous** *(adj.)*.
**barred** (bärd), *adj.* (١) میلدار (قوماش). (٢) کێلوون دراو؛ داخراو.
(٣) قەدەغە.
**barrel** (bar′əl), *n.* (١) بەرمیل؛ پیپ؛ دەبە. (٢) پڕ بەرمیلێك.
(٣) لوولەکێکی بۆش یا پتەو (پاندان): *( the ~ of a fountain pen)*.
(٤) لوولەی تفەنگ یا دەمانچە. (٥) قەفی پەڕی باڵندە.
(٦) لەش (ئەسپ، ڕەشەووڵاخ).
(٧) [Colloq.]، زۆر؛ فرە: *( a ~ of fun)*.
*v.t.* (١) خستنە بەرمیلەوە. (٢) هەڵگرتن؛ عەمارکردن.
*v.i.* [Slang], خێرا ڕۆیشتن.
**barrel-house** (bar′əl-hous′), *n.* (١) جۆرێکە لە مۆسیقای– " جاز " . (٢) مەیخانەیەکی ناوبانگ خراپ؛ قەحبەخانە.
**barrel organ,** ئۆرگانی دەستی: ئامێرێکی مۆسیقای بچووکە لە پیانۆ دەچێت.
**barren** (bar′ən), *adj.* (١) نەزۆك (ژن): *( a ~ woman)*.
(٢) نێر؛ نەزۆك (گیانەوەر).
(٣) بێبەر؛ ڕووتەنی؛ بەیار؛ بێ کەلك؛ چۆڵ: *( ~ soil, land, etc.)*.
(٤) ووشك و ناخۆش. (٥) بەتاڵ؛ نەبوو؛ بێ؛ ئێیەتی.
*n.* (١) زەویوزاری بێبەر یا ڕووتەنی.
(٢) *(pl.)*، زەویوزاری لماوی و دەوەناوی.
**-barrenness** *(n.)*.
**barret** (bar′it), *n.* تەپلە؛ کڵاوێکی بچووك.
**barrette** (bə-ret′), *n.* تەوقەی سەر (ژن).
**barricade** (bar′ə-kād′), *n.* (١) سەنگەر.
(٢) بەربەست (کە ڕێگەی پێ دەگیرێت لەکاتی شەڕی سەر شەقامدا)؛ کۆسپ.
*v.t.* (١) ڕێ لێ داخستن؛ ڕێی چوونەژوورەوە یا هاتنەدەرەوە نەدان.
(٢) کۆسپ لەبەردەمدا دانان؛ بەربەست کردن.
(٣) خۆ قایم کردن و نەهاتنە دەرەوە.
**barricado** (bar′i-kā′dō), *n.* = **barricade.**
**barrier** (bar′i-ẽr), *n.* (١) قەڵای پاراستنی شوێنێك.
(٢) دیوار؛ پەرژین؛ تەیمان.
(٣) کۆسپ؛ دیوار؛ بەربەست: *( Shyness was a ~ between them.)*.
(٤) سنوور. (٥) دەرگای گومرگ (لەسەر سنووری وولاتێك).
**barring** (bär′iŋ), *prep.* بێجگە لە؛ جگە لە.
**barrio** (bär′ri-ō′), *n.* گەڕەکی هەژاران؛ گەڕەك.
**barrister** (bar′is-tẽr), *n.* پارێزەر.
**barroom** (bär′rōōm′, bär′room′), *n.* بار؛ مەیخانە.
**barrow** (bar′ō), *n.* (١) عەرەبانەی دەستی.
(٢) پڕ عەرەبانەیەکی دەستی.
**barrow** (bar′ō), *n.* (١) گردۆلکە یا کەڵەکەبەردێکی بچووکی سەر گۆڕێك. (٢) [Dial.]، شاخ؛ گرد.
**barrow** (bar′ō), *n.* بەرازی خەساو.
**bartender** (bär′ten′dẽr), *n.* مەیخانەچی؛ بەردەستی بار؛ ساقی.
**barter** (bär′tẽr), *v.t.* (١) ئاڵوگۆڕکردن (شتومەك)؛ گۆڕینەوە:
*( He ~ed his watch for food.)*
(٢) سەوداکردن.
*n.* (١) ئاڵوگۆڕکاری؛ گۆڕینەوە (شتومەك). (٢) سەوداگەری؛ سەوداکردن
(٣) شتێکی ئاڵوگۆڕکراو.
barter away, بە هەرزان فرۆشتن؛ بەخۆڕایی لەدەستدان؛ بەبادان:
*( to barter away one's freedom and independence)*
**bartizan, bartisan** (bär′tə-z'n, bär′tə-zan′), *n.* قوللەیەکی دەرپۆقیو لەلای دیوارێك و سەربانێکەوە.

**barytone** (bar′ə-tōn′), *adj. & n.* = **baritone.**

**basal** (bā′s'l), *adj.* (١) بناغەیی؛ لە بنەوە دەرهاتوو؛ تایبەتی بە بن.
(٢) بنچینەیی؛ سەرەکی؛ گرنگ.

**basalt** (bə-sôlt′, bas′ôlt), *n.* بازۆلت؛ مەرمەڕی ڕەش؛
بەردێکی قورسی سەختی سووتاوی ئاگرپڕژێنییە.

**bascule** (bas′kūl), *n.* = seesaw.

**bascule bridge,** پردی بزوێن.

**base** (bās), *n.* (١) بنچینە؛ بناغە؛ بنەوان؛ ڕەگ.
(٢) بن *(the ~ of a thumb)*.
(٣) بنکە (سوپا، شۆڕش)؛ بارەگا؛ سەرشار (وەرزش).
(٤) چینی ژێرەوەی بۆیاخ. (٥) ماددەی سەرەکی ئاوێتەیەک.
(٦) ماددەیەکە کە لەگەڵ ترشەڵۆکدا تێکەڵاوکرا خوێی لێ پەیدا دەبێت.
(٧) ماددەیەکە دەکرێتە ناو بۆیە یا خومەوە بۆ چەسپاندنی ڕەنگەکەی.
(٨) هێڵی ژێرەوە (ئەندازە)؛ بن (٩) لاخوارووی قەڵغان.
(١٠) ڕەگ (بیرکاری). (١١) ڕەگی ووشە (زمانەوانی).

*v.t.* (١) بنچینە بۆ دانان. (٢) دامەزراندن؛ دانان.
*( Taxes are ~d on income.;* (٣) دانان لەسەر بنچینەیەک:
*He ~d his conclusions on false assumptions.)*

**base** (bās), *adj.* (١) نزم (دەنگ بەتایبەتی لە گۆرانیدا).
(٢) ناکەس؛ نزم؛ نامەرد؛ سووک: *( It is ~ to betray a friend.)*.
(٣) نزم (پلەی کۆمەڵایەتی). (٤) خراپ؛ قەڵب.
(٥) هەرزانەها؛ بێ نرخ: *( Iron is a ~ metal, gold a precious one.)*.
(٦) نارەسەن (زمان). (٧) ساختە. (٨) [Archaic]، کورت.
(٩) [Archaic]، زۆڵ؛ ناکەس بەچە.

*n.* دەنگێکی نزم (مۆسیقا، گۆرانی).

**baseball** (bās′bôl′), *n.* (١) یاری بێسبۆڵ. (٢) تۆپی ئەم یارییە.

**baseboard** (bās′bôrd′, bās′bōrd′), *n.* (١) تەختەدارێکە گۆشەی
نێوان زەمینەو بن دیوار دادەپۆشێت. (٢) تەختەی بناغە.

**baseborn** (bās′bôrn′), *adj.* (١) ناکەس بەچە؛ نامەرد؛ نزم؛ سووک.
(٢) زۆڵ (٣) بنەچە نزم یا هەژار؛ ناکەس بەچە

**baseless** (bās′lis), *adj.* بێ بناغە؛ نابەجێ؛ درۆ.
*( ~ accusations, fears, hopes, etc.)*

**base line,** (١) هێڵی بنچینە.
(٢) هێڵی نێوان دوو بنکەی یاری بێسبۆڵ.

**basely** (bās′li), *adv.* نامەردانە؛ ناکەسانە.

**basement** (bās′mənt), *n.* ژێرخان؛ ژێرزەمین (خانوو)؛ سەرداب.

**base metal,** کانزای کەم نرخ (وەک ئاسن).

**baseness** (bās′nis), *n.* (١) نامەردی؛ ناکەسی؛ ناپیاوی؛ سووکی.
(٢) کردەوەیەکی نزم یا ناکەسانە.

**basenji** (bə-sen′ji), *n.* سەگێکی ئەفەریقایی بچووکی سوورە حەپین
یا وەڕینی نییە

**bases** (bās′iz), *n. plural of* **base.**

**bases** (bā′sēz), *n. plural of* **basis.**

**bash** (bash), *v.t.* [Colloq.], بەتوندی لێدان؛ زرمە لێ هەڵسان؛
پیاماڵین؛ بیرازکردن

*n.* [Colloq.], زرمە؛ لێدانێکی توند؛ پیاکێشانێک.

**bashaw** (bə-shô′), *n.* ئەفەندی؛ پاشا؛ فەرمانبەرێکی گرنگ؛ خانزاد.

**bashful** (bash′fəl), *adj.* شەرمن؛ بە شەرم؛ کەم ڕوو.

**basic** (bās′ik), *adj.* (١) سەرەکی؛ بنچینەیی؛ گرنگ؛ بناغەیی؛
ڕیشەیی؛ سەرەتایی: *( ~ principles)*.
(٢) تفت (کیمیا).

**basically** (bās′i-k'l-i, bās′ik-li), *adv.* بە ڕادەی یەکەم؛ بەزۆری؛
بەشێوەیەکی بنچینەیی یا سەرەکی

**Basic English,** زمانی ئینگلیزی سەرەتایی یا بنچینەیی (کە بریتییە
لە هەشت سەدو پەنجا ووشەی پێویست و بناغەیی ئینگلیزی).

**basidiomycete** (bə-sid′i-ō′mī-sēt′), *n.* جۆرە ڕووەکێکە وەک
قارچك و دووەمەڵان.

**basil** (baz′'l), *n.* ڕێحانە.

**basilar** (bas′ə-lēr), *adj.* (١) بنچینەیی (بەتایبەتی هی کاسەی سەر)؛
ڕیشەیی. (٢) بنچینەیی؛ سەرەکی؛ گرنگ.

**basilary** (bas′ə-ler′i), *adj.* = **basilar.**

**basilic** (bə-sil′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە بۆری خوێنی قۆڵ.
(٢) [Obs.]، شاهانە.

**basilica** (bə-sil′i-kə), *n.* (١) کۆشکی شاهانە.
(٢) هۆڵێکی لاکێشەی کۆڵەکەدار (لە خانوویەکی ڕۆمانی کۆندا)؛
خانوویەکی وەها. (٣) کڵێسەیەکی کۆنی وەها.

**basilisk** (bas′ə-lisk′), *n.* (١) گیاندارێکی خشۆکی ئەفسانەییە وەک
قۆڕی وایە هەناسەو سەیرکردنەکەی کوشندەیە.
(٢) جۆرە قۆڕییەکی ئەمریکییە.
(٣) تۆپێکی جەنگیی کۆنی بە قۆڕی کانزایی ڕازێنراوەیە.

**basin** (bā′s'n), *n.* (١) تەشت؛ سوێنە. (٢) جوڕنە؛ دەستشۆر.
(٣) پڕ تەشتێك؛ ئەوەندەی تەشتێك دەیگرێت.
(٤) عەماراو؛ ئەستێڵ؛ حەوز؛ چاڵ؛ قووڵایی. (٥) کەنداو.
(٦) سەرچاوەی ڕووبار: *( river ~ )*.
(٧) چاڵایی بن دەریا: *( ocean ~ )*.

**basinet** (bas′ə-nit), *n.* کڵاوزرێیەکی سووك؛ کڵاوی ئاسن.

**basis** (bā′sis), *n.* (١) بنچینە؛ بناغە. (٢) دانەبەشی سەرەکی؛ کۆڵەکە.
(٣) تیۆری یا پەیڕەوی سەرەکی پێوانە؛ پێوەر؛ بناغە.

**bask** (bask, bäsk), *v.i. & v.t.* (١) خۆهەڵخستن لەبەر هەتاو:
*( He ~ed in the sun.)*
(٢) پاڵ لێدانەوە لەخۆشیدا؛ بسکەی سمێڵ هاتن لەخۆشیدا؛ لرف لێدان:
*( He ~ed in her favor.)*

**basket** (bas′kit, bäs′kit), *n.* (١) زەمیلە؛ سەبەتە. (٢) پڕ زەمیلەیەك.
(٣) (ا) تۆپی یاری باسکە. (ب) تۆپ خستنە ناو تۆڕی باسکەوە.

**basketball** (bas′kit-bôl′, bäs′kit-bôl′), *n.* (١) یاری باسکە.
(٢) تۆپی باسکە.

**basket case,** ئەخۆشێکی چوارپەل بڕراوە؛ نەخۆشێکی پەرێشان و
هیوای چاکبوونەوە لێ نەکراو.

**basket hilt,** دەسکە شمشێرێکە لەشێوەی زەمیلەدا.

**basketry** (bas′kit-ri, bäs′kit-ri), *n.* (١) زەمیلە درووستکردن؛
زەمیلەکاری. (٢) زەمیلە؛ زەمیلەکان؛ سەبەتەکان.

**basket weave,** چنینی سەبەتەیی: قوماش چنینێکە بریتییە لە ڕاست و
چەپ لێکدانی تاڵەکان وەك تووڵی زەمیلەو سەبەتە.

**basophile** (bā′sə-fīl′, bā′sə-fil), *n.* خانەیەکی بەئاسانی ڕەنگ
وەرگر (ڕووەکناسی).

**Basque** (bask), *n.* (١) باسك؛ باسکی؛ یەکێك لە نەتەوەی باسك کە
لەسەرووی ئیسپانیاو ڕۆژاوای فەرەنسادا دەژی. (٢) زمانی باسکەکان؛
باسکی (زمان).

*adj.* باسکی (نەتەوە، خاك، زمان... هتد).

**basque** (bask), *n.* بلووزێکی تەسکی ژنانە.

**bas-relief** (bas′ri-lēf′, bä′ri-lēf′), *n.* نەخش و پەیکەری بەئاستەم
سەردەرهێناو یا دەرپۆقیو بە دیوارەوە.

**bass** (bās), *n.* (١) نزمترین دەنگی گۆرانی نێرینە.
(٢) نزمترین دەنگی مۆسیقا.
(٣) گۆرانی بێژێك یا ئامێرێکی مۆسیقایی ئەم جۆرە دەنگە.

*adj.* (١) دەنگ نزم.
(٢) دەتوانێت گۆرانی وەها نزم بڵێت یا مۆسیقای وەها نزم لێ بدات.

**bass** (bas), *n.* جۆرە ماسییەکە لە ئاوی دەریا هەروەها ڕووباریشدا دەژی.

**bass drum,** تەپڵێکی گەورەی دەنگ نزمە.

**basset** (bas′it), *n.* سەگێکی ڕاوی لەش درێژو قاچ کورت و گوێ شۆڕە.

**basset** (bas′it), ***n. & v.i.*** دەرکەوتن یا هاتنەسەر ڕووی زەوی کانزا لەژێر زەوی‌یەوە (زەمینناسی، کانگەری).
**bass horn,** جۆرە کەڕەنایەکە
**bassinet** (bas′ə-net′), ***n.*** بێشکەیەکی سەرگیراوی پێچکەدارە.
**basso** (bas′ō), ***n.*** دەنگێکی نزم و نێرانە؛ گۆرانی بێژێکی دەنگ نزم و نێر.
**bassoon** (ba-sōōn′, bə-sōōn′), ***n.*** ئامێرێکی مۆسیقایە لەبابەتی زوڕنا.
**basswood** (bas′wood′), ***n.*** (١) سنجوو درەختێکی گوڵ زەردو بۆن خۆشە دارەکەی سووک و قایمە. (٢) داری ئەم درەختە.
**bastard** (bas′tērd), ***n.*** (١) زۆڵ؛ کەسێکی زۆڵ؛ ناڕەسەن.
(٢) شتێکی ناڕەسەن، ساختە، یا درۆزنە.
(٣) [Slang]، کەسێکی ناکەس بەچە، نامەرد، یا سەگباب (جوێن).
(٤) [Slang]، کابرا (لەڕووی سووکی‌یەوە).
***adj.*** (١) زۆڵ. (٢) ساختە؛ درۆزنە؛ ناڕەسەن. (٣) قەلب؛ خراپ.
**bastard file,** بڕبەنگی ددان مام ناوەندی.
**bastardize** (bas′tērd-īz′), ***v.t.*** (١) زۆڵی و ناکەسی دەرخستن.
(٢) پیس کردن؛ تێکدان: ***(He ~d the language.)***.
**-bastardization *(n.)*.**
**bastardly** (bas′tērd-li), ***adj.*** (١) زۆڵ. زۆڵانە؛ ناکەسانە.
(٢) ناڕەسەن؛ ساختە؛ درۆزنە.
**bastardy** (bas′tēr-di), ***n.*** (١) زۆڵی؛ زۆڵێتی؛ ناکەس بەچەیی.
(٢) زۆڵ خستنەوە.
**baste** (bāst), ***v.t.*** جل و بەرگ دوورینەوە.
**baste** (bāst), ***v.t.*** ڕۆن یا کەرە لە گۆشت هەڵسوون لەکاتی سوورکردنەوەدا یا پیاکردنەوەی ڕۆناوی گۆشتەکە خۆی.
**baste** (bāst), ***v.t.*** (١) لێدان؛ دارکاری کردن.
(٢) سەرزەنشت کردن؛ شکاندن؛ جوێن پێدان؛ قسەی ناشرین پێ وتن.
**bastille, bastile** (bas-tēl′), ***n.*** (١) سەنگەرێکی بڕۆک (بۆ هێرش بردن یا خۆپاراستن لەکاتی جەنگدا). (٢) بەندیخانە.
**the Bastille,** بەندیخانەی باستیل: قەڵایەک بوو لە پاریس کرابوو بە بەندیخانە لە سەرەتای شۆڕشی فەرەنسادا لە ساڵی ١٧٨٩دا وێران کرا.
**bastinade** (bas′tə-nād′), ***n.*** = **bastinado.**
**bastinado** (bas′tə-nā′dō), ***n.*** (١) فەلاقە؛ دارکاری کردن.
(٢) دار؛ داردەست
***v.t.*** فەلاقەکردن. دارکاری کردن؛ لە بنی پێ دان بە دار.
**bastion** (bas′chən, bas′ti-ən), ***n.*** (١) سەنگەری ناو قەڵا (کە بریتی‌یە لە بەشێکی دەرپۆقیوی قەڵاکە).
(٢) قەڵا؛ مەڵبەند ***(a ~ of freedom and democracy)***.
**bat** (bat), ***n.*** (١) گورزی یاری بێسبۆڵ. (٢) گەڵاکوتک؛ دار.
(٣) ڕاکێتی یاری تەنس یا پینگ پۆنگ. (٤) لێدانی تۆپی بێسبۆڵ بە گورز.
(٥) نۆرەی ئەم لێدانە. (٦) تۆپەڵە گڵەجان.
(٧) [Colloq.]، لێدانێک؛ پیاکێشانێک. (٨) [Colloq.]، خێرایی.
(٩) [Slang]، ئاهەنگ و زەماوەندی خواردنەوە.
***v.t.*** لێدان یا پیاماڵین بە گورزی بێسبۆڵ یا گەڵاکوتک.
***v.i.*** (١) بەکارهێنانی گورزی یاری بێسبۆڵ.
(٢) نۆبەکردن لە لێدانی تۆپی بێسبۆڵدا.
**at bat,** نۆبە هاتنەسەر (لێدانی تۆپی بێسبۆڵ).
**bat around,** [Slang], (١) گەڕان؛ گەشتکردن؛ سووڕانەوە
(٢) لێکۆڵینەوە (بیروباوەڕ، نەخشە، پیلان).
**go to bat for,** [Slang], لەسەرکردنەوە؛ پشتیوان کردن بەتوندی:
***(He went to bat for his friend.)***
**bat** (bat), ***n.*** شەمشەمەکوێرە
**blind as a bat,** کوێری تەواو؛ کوێر
**bat** (bat), ***v.t.*** [Colloq.], چاونووقاندن؛ چاوداگرتن؛ پەشۆکان.
**not bat an eye,** [Colloq.], نەپەشۆکان؛ خۆ تێک نەدان.

**batch** (bach), ***n.*** (١) ئەو نانەی کە بە یەک جار دەکرێت.
(٢) ئەو هەویرەی پێویستە بۆ نان کردنی جارێک: ***(a ~ of dough)***.
(٣) بەرهەمی جارێک؛ سەرجەمی ئەو شتەی بە یەک جار دروست کرابێت
(٤) دەستە؛ کۆمەڵ (مرۆڤ، شت)؛ تاقم؛ پۆل؛ چەپک.
**bate** (bāt), ***v.t.*** (١) کەمکردنەوە؛ کزکردن.
(٢) خۆڕاگرتن؛ دەمی خۆ گرتن؛ دەرنەبڕین.
(٣) لێ داشکاندن؛ لێ لادان؛ لێ دەرکردن؛ لێسەندنەوە.
***v.i.*** کەم بوونەوە؛ کزبوون.
**with bated breath,** هەناسە بۆ نەدران (لە ترسدا یا لە خۆشیدا).
**bate** (bāt), ***v.t. & v.i.*** پێستە خۆش کردن.
***n.*** دەرمانی پێستە خۆش کردن.
**bateau** (ba-tō′), ***n.*** بەلەمێکی بچووکە.
**batfowl** (bat′foul′), ***v.i.*** ڕاوکردنی مەل بە شەوکوێرکردنیان و گرتنیان بە تۆڕ یا کوشتنیان.
**bath** (bath, bäth), ***n.*** (١) خۆشتن. (٢) ئاوی خۆشتن.
(٣) گەرماو؛ سەرشۆرک؛ ژووری خۆشتن. (٤) بانیۆ. (٥) (*pl.*)، گەڕاو.
(٦) کانزای تواوە لە کوورەدا. (٧) دەرمانی وێنە شتنەوە.
***v.t. & v.i.*** شتن؛ لە ناو هەڵکێشان؛ خووساندن؛ خۆشتن.
**bathe** (bā*th*), ***v.t.*** (١) نوقوم کردن لە ئاودا؛ خستنە ئاوەوە.
(٢) شتن: ***(She ~d the baby.)***.
(٣) تەڕکردن.
(٤) داپۆشین؛ هەمووگرتنەوە: ***(The trees are ~d in moonlight.)***.
***v.i.*** (١) خۆشتن؛ گەرماوکردن.
(٢) مەلەکردن؛ خۆتێهەڵکێشان.
(٣) خۆهەڵخستن: ***(to ~ in the sun)***.
**-bather *(n.)*.**
**bathetic** (bə-thet′ik), ***adj.*** (١) هیچ و پووچ (شێوازی نووسین یا دووان). (٢) درۆزنە (سۆز، هەست).
**bathhouse** (bath′hous′, bäth′hous′), ***n.*** (١) گەرماوی گشتی.
(٢) ژووری خۆگۆڕین لە گەرماوی گشتیدا.
**bathing cap,** کڵاوی خۆشتن (بۆ تەڕ نەبوونی قژ)؛ کڵاوی مەلەکردن.
**bathing suit,** دەرپێی مەلەکردن؛ جل و بەرگی مەلەکردن.
**batho-** (bath′ō), پێشگرێکە بەمانای: قووڵی؛ قووڵایی.
**bathometer** (bə-thom′ə-tēr), ***n.*** پێوەری قووڵایی ئاو.
**bathos** (bā′thos), ***n.*** (١) بە ئاخدا چوون (شێوازی نووسین و دووان)؛ دانە دواوە. (٢) سۆزی درۆ؛ هەست و سۆزی نابەجێ.
**bathrobe** (bath′rōb′, bäth′rōb′), ***n.*** ڕۆبی گەرماو.
**bathroom** (bath′rōōm′, bäth′room′), ***n.*** (١) گەرماو؛ سەرشۆرک. (٢) ئاودەستخانە؛ توالێت.
**bathtub** (bath′tub′, bäth′tub′), ***n.*** حەوزی خۆشتن؛ بانیۆ.
**bathy-** (bath′i), پێشگرێکە بەمانای: قووڵ؛ تایبەتی بە بنی دەریا.
**bathymetry** (bath′i-met′ri), ***n.*** پێوانی قووڵی دەریا.
**-bathymetric; bathymetrical *(adj.)*.**
**bathyscaph** (bath′i-skaf′), ***n.*** بەلەمێکی ژێرئاوی‌یە بۆ چوونە ناو قووڵایی دەریا.
**bathysphere** (bath′i-sfêr′), ***n.*** بەلەمێکی ژێرئاوی‌یە بۆ لێکۆڵینەوە لە زیندەوەرو ڕووەکی قووڵایی دەریا.
**batik** (bə-tēk′, bä′tēk, bat′ik), ***n.*** (١) نەقش و نیگار لەسەر دروستکردنی پارچەیەک قوماش بە لە خوم هەڵکێشانی و داپۆشینی ئەو بەشانەی کە ناوێسترێ نەقشی لەسەر دەرچێت. (٢) قوماشێکی نەقش و نیگار لەسەر دروستکراو بەم شێوەیە. (٣) ئەم نەقش و نیگارە.
***adj.*** تایبەتی بە بەم جۆرە نەقش و نیگارو قوماشە.
***v.t.*** نەقش و نیگار دروستکردن لەسەر قوماش بەم جۆرە.
**bating** (bāt′iŋ), ***prep.*** [Archaic], بێجگە لە؛ جگە لە.
**batman** (bat′mən), ***n.*** بەردەستی ئەفسەرێکی ئینگلیزی.

**baton** (ba-ton′, bat′'n), *n.* (١) گورزی ئەفسەر یا پۆلیس
(٢) داری باریکی سەرەك ئۆركێسترا یا تیپی مۆسیقا.
(٣) شیشێکی باریکی ئاسنی سەرخڕە پێشەنگی خۆپیشاندان بە ئاسماندا هەڵی دەدەن و دەیگرنەوە
**Batrachia** (bə-trā′ki-ə), ***n.pl.*** (١) گیانداری تەڕو ووشکی بێ کلك (وەك بۆق (٢) گیاندارە تەڕو ووشکییەکان
**batrachian** (bə-trā′ki-ən), *adj.* تایبەتی بە گیانداری تەڕو-ووشکی؛ تەڕو ووشکی.
***n.*** گیانداری تەڕو ووشکی.
**batsman** (bats′mən), *n.* یاریکەری یاری بێیسبۆڵ و کریکێت.
**battalion** (bə-tal′yən), ***n.*** (١) دەستە لەشکرێکی ئامادە بۆ جەنگ.
(٢) ژمارەیەکی زۆر؛ تابوور: ***( a ~ of strikers)***.
(٣) (*pl.*)، لەشکر؛ سوپا. (٤) دەستە لەشکر؛ پەل
**batten** (bat′'n), ***n.*** (١) پارچە تەختەی زەوی داپۆشەر.
(٢) پارچەیەك تەختەی باریك کە درزی نێوان دوو تەختەی پێ دادەپۆشرێت.
***v.t.* ( ~ down ),** قایم کردن بە پارچەیەك تەختەی باریك.
**batten** (bat′'n), *v.i.* (١) قەڵەوبوون.
(٢) دەوڵەمەندبوون یا خۆش ڕابواردن لەسەر حسابی یەکێکی تر.
(٣) هاتنەبەر؛ بەرگرتن.
***v.t.*** قەڵەوکردن؛ دابەستن.
**batter** (bat′ẽr), *v.t.* (١) پەیتا پەیتا و بە قایم کوتاندنەوە؛ پیاکێشان؛ بەتوندی لێدان. (٢) ووردوخاش کردن؛ پیامالین و شکاندن؛ داگرتنەوە.
(٣) شکاندن؛ زۆر بەکارهێنان و لەکەڵك خستن:
***( The furniture was ~ed.)***
(٤) لێدان؛ ئازاردان ***( a ~ed wife, child, etc.)***
***v.i.*** پیاکێشان پەیتا پەیتا و بە قایم.
***n.*** تیپی شکاو (چاپەمەنی).
**batter** (bat′ẽr), ***n.*** یاریکەرێك کە نۆبەی هاتووە لە تۆپ بدات (کریکێت، بێیسبۆڵ).
**batter** (bat′ẽr), ***n.*** گیراوەی ئاردو شیرو هێلکە بۆ کێك دروستکردن یا چێشت لێنان
**batter** (bat′ẽr), ***v.t. & v.i.*** بەرە بەرە لێژبوونی دیوارێك لە بناغەوە بۆ سەرەوە
**battering-ram** (bat′ẽr-iŋ-ram′), *n.* چەکێکی جەنگیی کۆنە پەیتا پەیتا دەکێشرا بە شوورەی شاری ئابلووقەدراودا بۆ ڕووخاندنی و چوونە ناو شارەکەوە
**battery** (bat′ẽr-i), ***n.*** (١) پیامالین؛ کوتانەوە؛ لێدان (بە دەست، شەق، یا شتێك؛ تێهەڵدان: ***( assault and ~ )***
(٢) (أ) تۆپ (سوپا، کەشتی جەنگ). (ب) بنکەی تۆپ (ج) لقی تۆپدار.
(٣) تۆپ هاوێژو تۆپ گرەوە (یاری بێیسبۆڵ). (٤) باتری؛ پیل
(٥) دەستەیەك شتی چوونیەك
**in battery,** ئامادەیە بۆ تەقاندن (تۆپ، تفەنگ).
**battik** (bat′ik), *n., adj. & v.t.* = **batik.**
**batting** (bat′iŋ), ***n.*** (١) لێدانی تۆپ بە گورز (یاری بێیسبۆڵ)
(٢) تۆیەڵ یا تۆی لۆکەو خوری (بۆ تێئاخنینی لێفەو کورسی).
**battle** (bat′'l), ***n.*** (١) جەنگ؛ شەڕ (٢) شەڕ؛ ناکۆکی؛ خەبات
***v.t. & v.i.*** شەڕکردن؛ جەنگین؛ خەبات کردن.
**battle array,** (١) ئامادەکردن و ڕیزکردنی هێزی چەکدار بۆ جەنگ.
(٢) کەرەسەی جەنگ
**battle-ax, battle-axe** (bat′'l-aks′), ***n.*** (١) تەوری جەنگ
(٢) [Slang]، ژنێکی کەڵەو بەزەبر.
**battle cruiser,** کەشتی جەنگیی تیژڕەو.
**battle cry,** (١) بانگی جەنگ؛ هاواری جەنگ
(٢) دروشم؛ دروشمی خەبات یا جەنگ.
**battlefield** (bat′'l-fēld′), ***n.*** (١) مەیدانی شەڕ؛ مەیدانی جەنگ.
(٢) مەیدانی ناکۆکی یا ملەملێ.
**battle front,** مەیدانی جەنگ.
**battleground** (bat′'l-ground′), ***n.* = battlefield.**
**battlement** (bat′'l-mənt), ***n.*** سەنگەر؛ سەنگەری سەر قەڵایەك.
**battleplane** (bat′'l-plān′), ***n.*** فڕۆکەی جەنگی.
**battle royal,** (١) گەلەکۆمەکی.
(٢) شەڕی مردن و ژیان؛ جەنگێکی قورس.
(٣) مشتومڕێکی زۆر؛ دەمەقاڵێیەکی گەرم.
**battle-scarred** (bat′'l-skärd′), ***adj.*** شوێن برینی شەڕی پێوەیە.
**battleship** (bat′'l-ship′), ***n.*** کەشتی جەنگی.
**battue** (ba-tōō′, ba-tū′), ***n.*** (١) لە دارو دەوەن دان بۆ هاتنەدەرەوەی گیاندارو باڵندەو ڕاوکردنیان. (٢) ئەم جۆرە ڕاوە.
(٣) ئەو نێچیرەی بەم جۆرە ڕاودەکرێت.
(٤) قەلاچۆکردن بە کۆمەڵ.
**batty** (bat′i), ***adj.*** [Slang], (١) شێت؛ شێتۆکە. (٢) سەیر؛ نائاسا.
**bauble** (bô′b'l), ***n.*** (١) ڕەنگاوڕەنگیانە؛ شتێکی بریقەداری بازاڕی.
(٢) بووکەشووشە.
**baulk** (bôk), ***n., v.t. & v.i.* = balk.**
**bauxite** (bôk′sīt, bō′zīt), ***n.*** کانزایەکە فافۆنی لێ دەردەهێنرێت.
**Bavarian** (bə-vâr′i-ən), ***adj.*** باڤاری (گەل، زمان، کلتوور).
***n.*** (١) هاوولاتییەکی باڤاریا؛ باڤاری.
(٢) زمانی باڤاری (کە لقێکە لە زمانی ئەڵمانی).
**bawd** (bôd), ***n.*** (١) گەواد (ژن یا پیاو)؛ سەرەك قەحبەخانە.
(٢) [Rare]، قەحبە.
**bawdry** (bôd′ri), ***n.*** (١) زمان پیسی؛ قسەی سووك و ناشرین.
(٢) [Archaic]، گەوادیتی؛ پیشەی گەواد.
(٣) [Obs.]، قەحبەیەتی؛ داوێن پیسی.
**bawdy** (bô′di), ***adj.*** زمان پیس؛ سووك و ناشرین (ووتە)؛ بێ پەردەو سەرسەرییانە (زمان، کردەوە): ***( ~ language)*** .
-bawdily ***(adv.)***; **bawdiness *(n.)*.**
**bawdyhouse** (bô′di-hous′), ***n.*** قەحبەخانە.
**bawl** (bôl), ***v.i. & v.t.*** (١) قیژاندن؛ هاوارکردن.
(٢) [Colloq.]، گریان بە دەنگی بەرز.
***n.*** (١) قیژە؛ هاوار. (٢) [Colloq.] ، گریان بە دەنگی بەرز.
**bawl out,** (١) هاوارکردن؛ قیژاندن.
(٢) [Slang]، سەرزەنشت کردن؛ شکاندن؛ شتن (مەجاز).
**bay** (bā), ***n.*** کەنداو؛ ئاودڕ.
**bay** (bā), ***n.*** (١) بەشێك یا لایەکی دەرپۆقیوی خانوو.
(٢) قوژبنێکی بە کۆڵەکە دەورەدراو.
(٣) لایەکی کایەنە بۆ عەمارکردنی دانەوێڵەو گزرە.
(٤) ژووری نەخۆش و برینداری ناو کەشتی.
(٥) تاقی ناو دیوار.
**bay** (bā), ***v.i.*** وەڕین؛ لوورەلوورکردن؛ قرووسکاندن.
*v.t.* (١) پێ وەڕین. (٢) پێ وەڕین و ڕاونان.
(٣) گەمارۆدان؛ کردنەکونەوە؛ تەنگ پێ هەڵچنین.
***n.*** (١) وەڕە؛ لوورە؛ قرووسکەقرووسك. (٢) گەمارۆ.
**at bay,** گەمارۆدراو؛ بەگیرهێنراو؛ تەنگ پێ هەڵچنراو.
**bring to bay,** گەمارۆدان؛ کردنە کونەوە؛ تەنگ پێ هەڵچنین.
**keep (or hold) at bay,** بەرهەڵستی کردنی دوژمن و لەدوورەوە ڕاگرتنی؛ وەستاندنی دوژمن لە جێی خۆی و ڕێی هاتنەپێشەوە لێگرتن:
***( The bear kept the hunters at bay.)***
**bay** (bā), ***n.*** (١) درەختێکی هەمیشە سەوزە.
(٢) (*pl.*)، گوڵبەندی گەڵای ئەم درەختە.
(٣) (*pl.*)، پلەوپایە بەرزی؛ ناوداری؛ سەربەرزی.
**bay** (bā), ***adj.*** کوێت.

*n.* (١) ئەسپ و مایینی کوێت؛ گیاندارێکی کوێت.
(٢) کوێت؛ قاوەیی سوورباو.
**bayadere, bayadeer** (bä′yə-dêr′), *n.* (١) کچێکی سەماکەر لە پەرستگایەکی هیندیدا. (٢) قوماشی میلداری چەپ و ڕاست.
**bayard** (bā′ērd), *n.* (١) ئەسپ یا مایینی کوێت.
(٢) [B-]، ئەسپێکی ئەفسانەیییە.
(٣) ئەسپ (لەڕووی گاڵتەوە).
**bay leaf,** گەڵای بۆنداری درەختێکی هەمیشە سەوزە.
**bayonet** (bā′ə-nit, bā′ə-net′), *n.* نێزە؛ ڕم؛ قەمەی تفەنگ؛ سونگی.
*v.t.* نێزە، سونگی، ڕم، یا قەمە لێدان.
*v.i.* نێزە، سونگی، ڕم، یا قەمە بەکارهێنان.
**bayou** (bī′ōō), *n.* زێ؛ چەم.
**bay window,** (١) پەنجەرەی دەرپەڕیو. (٢) [Slang] ، وورگی زل.
**baywood** (bā′wood′), *n.* جۆرێکە لە دارخەیزەران.
**bazaar, bazar** (bə-zär′), *n.* (١) بازاڕ (٢) فرۆشگا؛ دووکان.
(٣) فرۆشتنی شتومەك بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ کڵێسە یا یانەیەك.
**bazooka** (bə-zōō′kə), *n.* بازووکە: چەکێکی سەرشانی مووشەك- تەقێنەرە
**B.B.C.,** = British Broadcasting Corporation.
**B.C.,** = Before Christ.
**bdellium** (del′i-əm), *n.* (١) جەوی؛ گەوەن؛ سرێش.
(٢) درەختی جەوی. (٣) بەردێکی بەنرخە لە ئینجیلدا ناوی براوە.
**be** (bē; *unstressed,* bi), *v.i.* (١) بوون؛ هەبوون؛ ژین؛ ژیان:
*(She is no more. ; I am here. ; She is there.)*
(٢) بوون؛ ڕوودان: *( When will the wedding ~ ?)* .
(٣) بەردەوام بوون؛ خایاندن؛ مانەوە: *( Will he ~ here long?)* .
(٤) بوون (لەشوێنێکدا): *( The food is on the table.)* .
(٥) لێ بوون؛ چوون: *( Have you been to Italy?)* .
(٦) وا بوون: *( She is my sister. ; He is clever.)* .
(٧) والێکردن؛ والێهاتن: *( He will ~ whipped.)* .
**be off,** (١) بڕۆ؛ (٢) ڕۆیشتن.
**be** (bē, bi), پێشگرێکە بەمانای: (١) بەدەوریدا: *(besprinkle)* .
(٢) هەمووی؛ بەتەواوی: *(besmear)* .
(٣) لێسەندن؛ وەرگرتنەوە: *(bereave, betake)* .
(٤) دەربارەی: *(bethink, bemoan)* . (٥) کردن: *(bedirty)* .
(٦) لەگەڵدا کردن؛ کردن: *(befriend, becloud)* .
(٧) داپۆشراو بە؛ هەبوو: *(bewhiskered)* .
**beach** (bēch), *n.* کەناری دەریا؛ ڕۆخی لمینی دەریا.
**beachcomber** (bēch′kōm′ēr), *n.* (١) شەپۆلێکی گەورەیە دەدات بە ڕۆخی دەریادا. (٢) کەسێکی وێڵە کە بە دەست لە خەڵك پان کردنەوە دەژی لە ڕۆخی دەریادا.
**beachhead** (bēch′hed′), *n.* بنکەی لەشکری داگیرکەر لەسەر ڕۆخی دەریای دوژمن.
**beacon** (bē′kən, bē′k′n), *n.* (١) ئاگری پەیامنێر یا ووریاکردنەوە بە شوێنێکی بەرزەوە. (٢) چرای ڕێ پیشاندەر؛ چرای ئاگاداری.
(٣) چرای ڕێ پیشاندەری سەر ڕۆخی دەریا.
(٤) گردێك یا بورجێك کە نیشانەو پەیامی لێوە دەنێردرێت.
(٥) نیشانە (بەتایبەتی هی ووریاکردنەوە).
(٦) نیشانەو پەیامی بێتەل کە دەدرێت بە فڕۆکە بۆ ڕێ پیشاندانی.
*v.t.* (١) ڕووناك کردنەوە؛ ڕۆشن کردنەوە (تاریکی).
(٢) نیشانەکردن بە چرا یا ڕووناکی.
(٣) ڕێ پیشاندان بە چرا یا ڕووناکی؛ ڕێ ڕووناك کردنەوە یا پیشاندان.
*v.i.* (١) بریقانەوە؛ شەوقدانەوە؛ درەوشانەوە.
(٢) ڕێ پیشاندان؛ چاوساغی کردن.

**bead** (bēd), *n.* (١) مووروو؛ زەنگیانە؛ کووژمەکە؛ دەنکە تەزبیح.
(٢) (*pl.*)، تەزبیح. (٣) (*pl.*)، ملوانکە؛ گەردنبەند.
(٤) چوکلەنیشان (تفەنگ، دەمانچە).
(٥) دڵۆپ (خوێن، ئارەق، ئاو)؛ بڵق. (٦) کەفی بیرە.
(٧) تۆسقاڵێك زێڕ یا زیو. (٨) ڕیزە مووروی دیوار ڕازێنەرەوە.
*v.t.* (١) ڕازاندنەوە بە مووروو یا زەنگیانە. (٢) هۆنینەوە (وەك تەزبیح).
*v.i.* خڕبوون؛ وەك مووروو لێهاتن؛ بوون بە دڵۆپ.
**count (or tell or say) one's beads,** دۆعاکردن بە تەزبیحەوە
**draw a bead on,** نیشان لێگرتنەوە.
**beaded** (bēd′id), *adj.* (١) بە مووروو و زەنگیانە ڕازاوە.
(٢) مووروودار. (٣) دڵۆپ دڵۆپ وەستاو؛ خڕ وەك مووروو.
**beadhouse** (bēd′hous′), *n.* هەژارخانە؛ تەمەڵ خانە: بەتایبەتی کە هەژارەکانی دەبوایە دۆعایان بکردایە بە تەزبیحەوە بۆ خێرپێکەرەکانیان.
**beading** (bēd′iŋ), *n.* (١) مووروو هۆنینەوە. (٢) ملوانکە؛ تەزبیح.
(٣) ڕیزە مووروو و زەنگیانە کە بۆ جوانی دەنرێت بە جلوبەرگەوە.
(٤) نەخش و نیگاری سەر جلوبەرگ کە لە ڕیزە مووروو دەچێت.
(٥) کەفی بیرە.
**beadle** (bē′d'l), *n.* (١) پەیامبەر. (٢) پێشەنگی خۆپیشاندانێکی زانکۆ.
(٣) یاریدەدەری قەشە؛ یاریدەدەری مالووم لە کەنیشتەدا.
**beadledom** (bē′d'l-dəm), *n.* لەخۆبایی بوون و کەرێتی و ناڵەباریی فەرمانبەری بچووکی میری.
**beadroll** (bēd′rōl′), *n.* (١) لیستەی ناو؛ لیستەیەکی درێژی ناو.
(٢) لیستەی ناوی ئەو مردووانەی دۆعایان بۆ دەکرێت (کڵێسەی کاسۆلیکی)
**beadsman** (bēdz′mən), *n.* (١) دۆعاکردن بۆ مردوو بە پارە.
(٢) سواڵکەر. (٣) نیشتەنی هەژارخانە یا تەمەڵ خانە.
**beadwork** (bēd′wūrk′), *n.* (١) مت و موورووکاری؛ زەنگیانەکاری.
(٢) ڕیزە موورووی سەر جلوبەرگ بۆ جوانی.
**beady** (bēd′i), *adj.* (١) زەنگیانەیی؛ خڕو بچکۆلەو بریقەدار.
(٢) بە زەنگیانە ڕازاوە. (٣) پڕ لە دڵۆپی خڕی زەنگیانەیی.
**beagle** (bē′g'l), *n.* سەگێکی بچووکی پێست لووسی قاچ کورتی گوێ شۆڕە.
**beak** (bēk), *n.* (١) دەنووك؛ دەنووکی باڵندەی نێچیروان.
(٢) شتێکی لە دەنووك چوو. (٣) [Slang]، لووتی گەورەو چەماوە.
(٤) [British Slang]، (ا) دادپرس؛ دادگەر. (ب) بەڕێوەبەری قوتابخانە.
(٥) گوێ سەبانە.
**beaked** (bēkt, bēk′id), *adj.* (١) دەنووکدار.
(٢) چەماوە (وەك دەنووك).
**beaker** (bēk′ēr), *n.* (١) پەرداخی قنچکدار؛ کووپێکی جوان؛ پەرداخی بادە. (٢) شلەی ناو پەرداخێکی ڕازاوە.
(٣) شووشەی لێواردار کە دەرمانگەو کیمیاگەر بەکاری دەهێنێت
**beam** (bēm), *n.* (١) دەستەك؛ نیرگە؛ دارێکی درێژو ئەستوور؛ شەلمان.
(٢) مژان. (٣) میلی تەرازوو. (٤) تەرازوو. (٥) شیشی لەنگەر.
(٦) پەڕێکی درێژو ڕەقی باڵی هەڵۆ یا داڵ. (٧) قەفی شاخی بەرانەکێوی
(٨) نیرگەی کەشتی. (٩) پانایی کەشتییەك. (١٠) لای کەشتییەك.
(١١) [Slang]، پانایی سمت. (١٢) نوێڵ.
(١٣) تیشك؛ ڕووناکی؛ شەوق. (١٤) زەردەخەنە؛ بسکە.
(١٥) (ا) نیشانەی بە بێتەل نێردراو لە فڕۆکەخانەوە یا لە بەندەرەوە بۆ فڕۆکەو کەشتی. (ب) باشترین گۆشەی مایکرۆفۆن یا دەنگ گەورەکەر.
(ج) مەودای مایکرۆفۆن یا دەنگ گەورەکەر.
*v.t.* (١) تیشکدانەوە؛ شەوقدانەوە؛ بریقەدانەوە.
(٢) ڕێ پیشاندانی فڕۆکەوان و کەشتییەوان بە بێتەل.
(٣) بەرنامەی رادیۆ ئاراستەکردن.
*v.i.* (١) شەوقدانەوە؛ تیشکدانەوە؛ بریقانەوە.
(٢) زەردەخەنەگرتن؛ بسکەهاتن.
**off the beam,** (١) پەیڕەوی نەکەری ئامۆژگاری ڕێ پیشاندانی بێتەل

(فڕۆکە، کەشتی). (٢) [Slang]، بە هەڵەدا چوو؛ هەڵە.
**on the beam,** (١) لەسەر ڕێی ڕاست بەپێی ئامۆژگاری بێتەل (کەشتی، فڕۆکە)؛ (٢) [Slang]، (ا) لەسەر ڕێی ڕاست. (ب) باش کاردەکات؛ وورِیا.
**beamed** (bēmd), ***adj.*** (١) بە دەستەك كراو؛ دەستەکەکانی بەدەرەوەن: ***( a ~ ceiling)***
(٢) ئاراستەی شوێنێکی تایبەتی کراوە (بەرنامەی ڕادیۆ): ***( a ~ program)***
**beaming** (bēm'iŋ), ***adj.*** (١) ڕووناك؛ تیشکدەرەوە؛ شەوق دەداتەوە.
(٢) دڵشاد؛ دەم بە پێکەنین؛ ڕووخۆش و کراوە.
**beamy** (bēm'i), ***adj.*** (١) ڕووناك؛ تیشکدەرەوە؛ بەشەوق.
(٢) نێرگەیی؛ زل؛ پان و گەورە. (٣) شاخدار. (٤) پان (کەشتی).
**bean** (bēn), ***n.*** (١) دەنك: لۆبیا، فاسۆلیا، پاقلە، قاوە).
(٢) فاسۆلیا؛ لۆبیا؛ پاقلە. (٣) کەلوو.
(٤) ڕووەکی فاسۆلیا و لۆبیا و پاقلە... هتد.
(٥) [Slang]. مێشك؛ سەر.
***v.t.*** [Slang], بەسەردا کێشان.
**full of beans,** بەکەیف؛ بەدەماخ؛ کەیف قنج.
**spill the beans,** نهێنی درکاندن؛ ئاشکراکردنی نهێنی.
**beanbag** (bēn'bag'), ***n.*** (١) توورەکەیەکی پڕ لە پاقلە یا فاسۆلیایە یاری پێ دەکرێت. (٢) ئەم یارییە.
**beanpole** (bēn'pōl'), ***n.*** (١) دار یا چیلکەی فاسۆلیا پیاهەڵگەڕاو. (٢) کەسێکی درێژ و باریکەڵە.
**beanstalk** (bēn'stôk'), ***n.*** قەدی فاسۆلیا و پاقلە و لۆبیا.
**bear** (bâr), ***v.t.*** (١) هەڵگرتن؛ گواستنەوە؛ بردن.
(٢) پێوەبوون: ***( The letter bore his signature.)*** .
(٣) بوون؛ منداڵبوون: ***( She bore three children.)*** .
(٤) بەرگرتن: ***( It will ~ fruit.)***
(٥) خستنە ئەستۆ؛ هەڵگرتن: ***( Let him ~ the expenses.)*** .
(٦) شان دانە بەر؛ مل پێوەنان: ***( to ~ a burden)*** .
(٧) دەربردن؛ بەرگەگرتن: ***( I can't ~ it. ; They bore the torture.)*** .
(٨) ڕەوشت نواندن؛ هەڵسان و دانیشتن: ***( He ~s himself well.)*** .
(٩) لە دڵ گرتن (کینە): ***( to ~ a grudge)*** .
(١٠) شایەتی دان: ***( He will ~ witness.)*** .
(١١) شیان.
***v.i.*** (١) بەرگەگرتن؛ دەربردن.
(٢) بەر زۆر گرتن: ***( The tree ~s well.)*** .
(٣) ڕۆیشتن بەرەو: ***( The ship bore west.)*** .
**bear arms against,** چەك هەڵگرتن دژ بە؛ جەنگ لەگەڵ کردن.
**bear down,** (١) دەست پیانان بۆ خوارەوە. (٢) هەوڵێکی زۆر دان.
**bear down on,** (١) هێز خستنەسەر؛ قورسایی یا زەبر خستنەسەر.
(٢) هەوڵێکی زۆر دان. (٣) چوون بەرەو.
**bear in mind,** لەبیربوون؛ لەبیرنەچوون؛ نەخستنە پشت گوێ.
**bear on,** پەیوەندی پێوە بوون:
***( His story bears on the crime.)***
**bear out,** دەرخستن؛ چەسپاندن؛ ساغ کردنەوە؛ سەلماندن:
***( The results bear out his claims.)***
**bear up,** دەربردن؛ بەرگەگرتن
**bear with,** ئارام لێگرتن؛ چاوپۆشین؛ پەلەنەکردن:
***( Bear with me, please.)***
**bear** (bâr), ***n.*** (١) وورچ
(٢) [B-]. یەکێکە لە دوو کۆنەستێرەی کە پێیان دەوترێت: ( **the Great Bear and the Little Bear** )؛ حەوت برا؛ حەوتەوانە.
(٣) کەسێکی لە وورچ چوو؛ کەسێکی گەلحۆر قسەڕەق.
(٤) ئامێری کونکەر. (٥) پارەباز (بۆرسە)؛ جامباز.
***adj.*** نرخ لە شکاندایە (بۆرسە): ***( a ~ market)*** .
***v.t.*** نرخ شکاندن (بۆرسە)؛ جامبازی کردن بەنیازی نرخ شکاندن.
**be a bear for punishment,** (١) بەرگەی ناخۆشی گرتن؛ دەربردن.
(٢) کۆڵ نەدان؛ وورە بەرنەدان.
**bearable** (bâr'ə-b'l), ***adj.*** بەرگەی دەگیرێت (ئازار، ناخۆشی)؛ لەگەڵی دەردەبرێت.
**bearbaiting** (bâr'bāt'iŋ), ***n.*** یارییەکی کۆنە بریتییە لە سەگ تێ بەردانە وورچێکی بەستراوە و چەوساندنەوەی.
**beard** (bêrd), ***n.*** (١) ڕیش. (٢) پڕ (گوڵە گەنم و جۆ).
***v.t.*** (١) دەست دانە ڕیش؛ ڕیش گرتن.
(٢) ڕووبەڕوو وەستان؛ بەرهەڵستی کردن.
(٣) ڕیش بۆ کردن؛ ڕیش بۆ هێشتنەوە.
**bearded** (bêr'did), ***adj.*** (١) ڕیشدار؛ ڕیشی هەیە.
(٢) پڕاوی (گوڵە گەنم و جۆ)؛ پڕدار؛ قەڵاساوی.
**beardless** (bêrd'lis), ***adj.*** (١) بێ ڕیش.
(٢) ڕیش نەهاتوو لەبەر منداڵی. (٣) گەنج؛ منداڵ.
**bearer** (bâr'ēr), ***n.*** (١) هەڵگر (مرۆڤ، شت).
(٢) بەردار؛ بەرگر؛ گوڵدار. (٣) هەڵگری دارەتەرم.
(٤) هەڵگر یا پێدەری بانکەنۆت بۆ داواکردنەوەی قەرز.
**bear garden,** (١) شوێنی بەستنەوەی وورچێك و سەگ تێکردنی.
(٢) شوێنێکی پڕ لە دەنگە دەنگ و شەڕە شەق و هەراوهوریا.
**bearing** (bâr'iŋ), ***n.*** (١) ڕەوت؛ شێوەی ڕەفتار نواندن؛ شێوەی هەڵسان و دانیشتن. (٢) کۆڵەکە؛ پاڵپشت؛ بنکە.
(٣) زایین؛ بوون؛ منداڵبوون. (٤) بەرگرتن؛ توانای بەرگرتن یا منداڵبوون.
(٥) بەر؛ بەرهەم. (٦) بەرگەگرتن؛ دەربردن.
(٧) ***(pl.)***، ڕێگە؛ ڕێباز؛ لەنگەر: ***( The ship lost her ~s .)***
(٨) پەیوەندی: ***( The evidence had no ~ on the case.)*** .
(٩) ئەو بەشەی دەستەك یا نێرگەیەك کە لەسەر کۆڵەکە یا پایەیەك وەستاوە.
(١٠) درووشمی سەر قەڵغانی سوارچاك.
(١١) ئەو پارچەیەی مەکینەیەکە کە پارچەیەکی تری لەسەر دەخوولێتەوە
**lose one's bearing,** ڕێگە وونکردن؛ سەر لێ تێکچوون.
**bearing rein,** ڕەشمە؛ ڕەشوە.
**bear-leader** (bâr'lē'dēr), ***n.*** مامۆستای تایبەتی یا هاوڕەنگی گەشتی گەنجێکی دەوڵەمەند.
**bear's-ear** (bârz'êr'), ***n.*** ڕووەکێکە گوڵەکەی لە گوێی وورچ دەکات.
**bear's-foot** (bârz'foot'), ***n.*** ڕووەکێکی بۆن پیسە.
**bearskin** (bâr'skin'), ***n.*** (١) کەوڵی وورچ؛ فەروەی وورچ.
(٢) قوماشێکی خوری تووکنە.
(٣) جل و بەرگ و ژێرەخەری لە کەوڵی وورچ دروستکراو.
**beast** (bēst), ***n.*** (١) گیاندار (بێجگە لە ئادەمیزاد).
(٢) چوارپێ؛ زیندەوەری چوارپێ.
(٣) ڕەفتاری ناپەسەند و ناشرین؛ سرووشتی ناپەسەند.
(٤) کەسێکی دڕندە و کەر و بێ هەست و بێ ڕەوشت و ناپەسەند.
**beastliness** (bēst'li-nis), ***n.*** (١) چوارپێیەتی؛ ناپەسەندێتی؛ نامرۆڤایەتی. (٢) کردەوەیەکی نامرۆڤانە؛ کردەوەیەکی زۆر خراپ.
(٣) [Colloq.]، ناپەسەندی؛ خراپی؛ بەدی.
**beastly** (bēst'li), ***adj.*** (١) چوارپێیانە؛ نامرۆڤانە؛ ناشرین؛ پیس؛ دڕندە: ***( ~ behavior; a ~ act)*** .
(٢) [Colloq.]، ناخۆش؛ ناپەسەند: ***( What ~ weather!)***
***adv.*** [British], زۆر؛ نێجگار: ***( He was ~ drunk.)*** .
**beast of burden,** وولاخی بار.
**beast of prey,** گیانداری ڕاوکەر؛ نێچیروان.
**beat** (bēt), ***v.t.*** (١) لێدان (تەپڵ)؛ پیاکێشان؛ کوتان؛ پیادان:
***( to ~ a drum)***
(٢) بیزارکردن؛ دارکاری کردن؛ لێدان؛ فەلاقەکردن؛ تێهەڵدان.
(٣) تەخت کردنی ڕێگە بە پیاڕۆیشتن بە پێ یا بە سواری؛ ڕێگەکردنەوە:

*( We ~ a path to the road.)*
(٤) گەلالەکردن؛ چەکوشکاری کردن.
(٥) گرتنەوە بە پەیتا پەیتا تێکهەڵدان؛ تێکەلاوکردن.
(٦) شەقە لە باڵ هەڵسان؛ شەکاندنەوە (باڵ).
(٧) پشکنین؛ بەووردی گەڕان.
(٨) خۆپیاکردن بەزۆر: *( He ~s his way through the crowd.)* .
(٩) بردنەوە؛ بەزاندن؛ بۆڕپێدان: *( He ~s everyone.)* .
(١٠) نیشانە ناردن (وەك بە تەپڵ لێدان). (١١) [Colloq.]، سەرسووڕماندن.
(١٢) [Colloq.]، ساختەلێکردن؛ گزی لێکردن؛ خەڵەتاندن.
***v.i.*** (١) بە قایمی و پەیتا پەیتا لێدان؛ پیادان.
(٢) ژێر بنچك و دەوەن گەڕان بۆ ڕاوی نێچیر.
(٣) لێدان (دل): *( The heart ~s.)* .
(٤) دەنگ لێوەهاتن (وەك تەپڵ). (٥) [Colloq.]، بردنەوە؛ زاڵبوون.
***n.*** (١) لێدان (دل). (٢) لێدانێك؛ پیاکێشانێك؛ پیامالینێك.
(٣) گوزەرگای ڕۆژانە؛ گوزەرو ناوچەی لێپرسراوێتی پاسەوان، پۆلیس، یا ڕۆژنامەگەرێك: *( a policeman's ~ )* .
(٤) دەنگ (مۆسیقا، تەپڵ). (٥) [Slang]، ساختەچی.
(٦) دەستپێشکەری کردن لە بلاوکردنەوەی دەنگوباسێکدا (ڕۆژنامەگەری).
(٧) ئەندامێکی نەوەی دەورووبەری جەنگی جیهانیی دووەم لە ئەمەریکادا کە دژ بە نەریت و فەلسەفەی ژیان و ڕەووشت و جل وبەرگی کۆنە.
***adj.*** (١) ماندوو؛ هیلاك
(٢) تایبەتی بە کەسێکی دژ بە نەریت و خووی کۆن (ژمارە حەوت ببینە).
**beat about,** بۆ گەڕان؛ بەدوادا گەڕان.
**beat a retreat,** خۆ کشانەوە؛ کشانەوە (لەشکر).
**beat around (or about) the bush,** مەبەست بەدەستەوەنەدان؛ خولانەوە بەدەوری باسێکداو مەبەست بەدەستەوەنەدان؛ پێچە بەدەورە کردن.
**beat back,** ڕاونانی دوژمن؛ بەرهەڵستی کردنی هێرشی دوژمن و ڕاونانی.
**beat down,** (١) پەستنەوە؛ پێشێل کردن؛ سەرکوتانەوە.
(٢) [Colloq.]، نرخ پێ شکاندن.
**beat it! [Slang],** بڕۆ!؛ لاچۆ لەبەرچاوم!؛ ڕاکە!.
**beat off,** دەرکردن؛ ڕاونان
**beat up (on), [Slang],** بیرازکردن؛ کوتان؛ لێدان؛ تێهەڵدان.
**beaten** (bēt′′n), ***adj.*** (١) بیرازکراو؛ لێدراو؛ تێهەڵدراو.
(٢) تەنك و ڕێك وپێك کراو بە چەکوشکاری (کانزا): *( ~ silver)* .
(٣) زۆر پێیدا هاتوچۆکراو؛ ئاسایی؛ تەخت کراو بە پیاڕۆیشتن: *( a ~ path)* .
(٤) بەزیو؛ بەزێنراو؛ دۆڕاو. (٥) ماندوو؛ هیلاك.
(٦) پشکنراو (بۆ نێچیری ڕاو). (٧) تێکەلاو؛ تێکەڵ.
(٨) [Colloq.]، سەر لێ شێواو؛ سەرسووڕماو.
**off the beaten track (or path),** نائاسایی؛ ناوێزە؛ جیاواز؛ بێ ڕێنە.
**beater** (bēt′ēr), ***n.*** (١) بیرازکەر؛ تێهەڵدەر.
(٢) ئامێری خواردەمەنی شڵەقاندن یا تێکەڵ کردن.
(٣) ڕافرێنەری نێچیر لە کون و دەوەن بۆ ڕاوکردن.
**beat generation,** نەوەی دەورووپشتی جەنگی جیهانیی دووەم لە ئەمەریکادا کە دژ بە نەریت و فەلسەفەو ڕەووشت و جل وبەرگی کۆن بوون.
**beatific** (bē′ə-tif′ik), ***adj.*** (١) شادکەر؛ دڵخۆشکەر؛ شادمانکەر.
(٢) شاد؛ دڵشاد؛ پڕ لە خۆشی: *( a ~ smile)* .
**-beatifically** ***(adv.).***
**beatify** (bi-at′ə-fī′), ***v.t.*** (١) شادکردن؛ دڵشادکردن؛ بەختەوەرکردن.
(٢) پیرۆزکردنی مردوویەك (ئاینی کاسۆلیکی).
**-beatification** ***(n.).***
**beating** (bēt′iŋ), ***n.*** (١) لێدان؛ بیراز؛ تێهەڵدان. (٢) لێدانی دڵ.
(٣) بەزین؛ دۆڕاندن.
**beatitude** (bi-at′ə-tōōd′, bi-at′ə-tūd′), ***n.*** (١) شادمانی؛ دڵشادی؛ بەختەوەری. (٢) پیرۆزی
**the Beatitudes,** فەرمایشتەکانی عیسا لە ووتاری سەر شاخەکەدا (ئینجیل).
**beatnik** (bēt′nik), ***n.*** گەنجێکی ئەمەریکا کە دژ بە نەریت و فەلسەفەو ڕەووشت و جل وبەرگ و خووی کۆنە.
**beau** (bō), ***n.*** (١) کەسێکی تەڕپۆش.
(٢) دڵداری کچێك یا ژنێك؛ یار.
**beau geste,** (١) لاڵێکردنەوەیەکی پیاوانە؛ خۆ بە باش پیشاندان.
(٢) کردەوەیەکی بە ڕووخسار جوان و نارکرۆك بۆش.
**beauteous** (bū′ti-əs), ***adj.*** = **beautiful.**
**beautician** (bū-tish′ən), ***n.*** ئارایشتکەر؛ جوانکەر.
**beautification** (bū′tə-fə-kā′shən), ***n.*** جوانکردن؛ جوانکاری؛ ئارایشتگەری.
**beautiful** (bū′tə-fəl), ***adj.*** جوان؛ دڵگیر؛ شۆخ؛ قەشەنگ.
**the beautiful,** (١) جوان؛ جوانی. (٢) جوانان.
**beautify** (bū′tə-fī′), ***v.t.*** جوانکردن؛ نەخشاندن؛ ڕازاندنەوە.
***v.i.*** جوان بوون.
-beautifier ***(n.).***
**beauty** (bū′ti), ***n.*** (١) جوانی؛ جوانێتی. (٢) شتێکی جوان.
(٣) ئافرەتێکی جوان.
**beauty shop (or salon or parlor),** دەلاکخانەی ژنان؛ ئارایشتگا.
**beauty sleep,** [Colloq.], (١) نووستنی پێش نیوەشەو؛ خەوتنی باش
(٢) نووستنی زیادە.
**beauty spot,** (١) نیشانەیەکی بچووکی ڕەشە ئافرەت دەیخاتە سەر شان یا دەموچاوی بۆ جوانی. (٢) خاڵ؛ نیشانەیەکی سرووشتی سەر پێست (وەك شڵ). (٣) شوێنێك یا ڕووخسارێکی جوان.
**beaux** (bōz), ***n.*** *alternative plural of* **beau.**
**beaux arts,** هونەرە جوانەکان.
**beaver** (bē′vēr), ***n.*** گوڕهەڵکەنە.
**beaver** (bē′vēr), ***n.*** (١) پارچەیەکی بزۆکی کڵاوزرێ یا قەڵغانی کۆنە بۆ پاراستنی دەم و چەناگە. (٢) لێواری پێشەوەی کڵاوزرێ.
**becalm** (bi-käm′), ***v.t.*** (١) هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە.
(٢) وەستاندنی کەشتی بایەوانی بەهۆی نەبوونی باوە.
**became** (bi-kām′), *past tense of* **become.**
**because** (bi-kôz′, bə-kuz′), ***conj.*** چونکە؛ لەبەرئەوە؛ بەهۆی.
**because of,** بەهۆی؛ بە بۆنەی؛ لەبەر؛ لە سایەی.
**beccafico** (bek′ə-fē′kō), ***n.*** باڵندەیەکی بچووکی جریوەجریوکەری ئەورووپاییە.
**bechance** (bi-chans′, bi-chäns′), ***v.t. & v.i.*** ڕوودان.
**beck** (bek), ***n., v.t. & v.i.*** بانگ کردن بە دەست یا بە سەر.
**at the beck and call of,** ئامادەیە بۆ بەجێهێنانی هەموو خواستێك؛ سەری پێوە نییە بۆ بەجێهێنانی خواستی کەسێك؛ لەبەردەستدایە
*( He is at her beck and call.)*
**beck** (bek), ***n.*** جۆگەلە.
**becket** (bek′it), ***n.*** قولاپ یا پەتی قوڵفەدار بۆ چەسپاندنی شتێك.
**beckon** (bek′′n), ***v.i. & v.t.*** (١) بانگ کردن (بە دەست یا بە سەر).
(٢) بانگ کردن (مەجاز): *( The woods ~ .)* .
***n.*** نیشانەی بانگ کردن (بە دەست یا بە سەر).
**becloud** (bi-kloud′), ***v.t.*** (١) تاریك کردن؛ داپۆشین (وەك بە هەور).
(٢) شێواندن؛ لێڵ کردن؛ تێکدان.
**become** (bi-kum′), ***v.i.*** (١) والێهاتن؛ بوون؛ بوون بە.
(٢) گەورەبوون؛ گۆڕان و بوون بە: *( The tadpole ~s a frog.)* .
(٣) [Obs.]، ڕوودان.
***v.t.*** (١) پێکردن؛ بۆ شیان؛ شیان.
(٢) لێهاتن؛ جوان بوون بۆ: *( That hat ~s you.)* .

**become of,** لێ بەسەرهاتن؛ لێ ڕوودان:
***( What will become of the children if their father dies?)***

**becoming** (bi-kum′iŋ), *adj.* (١) شیاو؛ جوان (جلوبەرگ، کردەوە)؛ بەجێ: ***( Cursing is not ~ to a lady.)***
(٢) لێهاتوو (جلوبەرگ)؛ جوان نوێن: ***( a ~ dress)***
***n.*** پەیدابوون؛ بوون؛ هاتنە جیهانەوە

**bed** (bed), *n.* (١) جێگەی نووستن؛ چەرپایە؛ قەرەوێڵە.
(٢) جێگەی جووت بوون. (٣) گۆڕ. (٤) شەتڵگە. (٥) شەتڵو گوڵی شەتڵگە.
(٦) بنی ڕووبار، دەریاچە، یا دەریا: ***(riverbed)***
(٧) بناغە؛ بنچینە (بەتایبەتی هی تەخت): ***( a railroad ~ )***
(٨) کۆمەڵێ شتی نەرم کە وەك جێگەیان لێ دێت ***( a ~ of leaves)***
(٩) چین یا توێیەکی ژێرزەوی. ***( a ~ of coal)***
***v.t.*** (١) جێگەی نووستن پێدان (٢) کردنە خەو؛ خستنە ناو جێگەوە.
(٣) لەگەڵ جووت بوون؛ چوونە جێگە لەگەڵ؛ گاین
(٤) چەسپاندن؛ تێخستن و قایم کردن. (٥) ناشتن یا چاندن لە شەتڵگەدا.
(٦) زەوی خۆش کراو بۆ شەتڵگە. (٧) ڕاخستن؛ چین چین کردن.
***v.i.*** (١) چوونە جێگە؛ نووستن؛ حەوانەوە.
(٢) چین چین کردن؛ ڕاخستن چین بە چین

**bed and board,** (١) جێگەی خواردن و نووستن.
(٢) ماڵ ***( She has left his bed and board.)***

**bed down,** جێگەی نووستن ڕاخستن و تێیدا خەوتن.
**get up on the wrong side of the bed,** تووڕەونرز؛ تەنگەچیکلانە
**go to bed with,** جووت بوون لەگەڵ؛ چوونە جێگە لەگەڵ؛ گاین.
**put to bed,** کردنە خەو؛ خستنە ناو جێگە (منداڵ).
**take to bed,** لەگەڵ جووت بوون؛ بردنە جێگەوە؛ گاین.
**take to one's bed,** چوونە جێگە بەهۆی نەخۆشییەوە

**bedaub** (bi-dôb′), *v.t.* (١) تێهەڵسوون؛ لێ هەڵسواندن.
(٢) لە ڕادە بەدەر ڕازاندنەوە

**bedazzle** (bi-daz′′l), *v.t.* (١) سەرسووڕماندن؛ سەر لێ شێواندن (بە شەوق یا ڕووناکییەکی زۆر). (٢) دڵفڕاندن.

**bedbug** (bed′bug′), *n.* مێروویەکی بێ باڵی خوێن مژی سوورباوی ناوجێگەو ناوماڵە

**bedchamber** (bed′chām′bẽr), *n.* ژووری نووستن

**bedclothes** (bed′klōz′, bed′klō*thz*′), *n.pl.* شتوومەکی جێگەی نووستن (وەك: چەرچەف، لێفە، بەتانی، سەرین)

**bedcover** (bed′kuv′ẽr), *n.* سەرەخەری جێگەی نووستن (وەك: پۆپەشمێن)

**bedding** (bed′iŋ), *n.* (١) نوێن؛ پێخەف.
(٢) پووش و بەڵەمبرنج کە دەخرێتە ژێر گیاندارەوە وەك جێگە.
(٣) بنچینە؛ بناغە. (٤) کردنە خەو؛ خستنە ناو جێگە.
(٥) بە کۆمەڵ ڕوواندنی ڕووەك بۆ جوانی.
(٦) چین چینی زەوی (زەویناسی)

**bedeck** (bi-dek′), *v.t.* ڕازاندنەوە.

**bedehouse** (bēd′hous′), *n.* = beadhouse.

**bedesman** (bēdz′mən), *n.* = beadsman.

**bedevil** (bi-dev′′l), *v.t.* (١) ڕەووشت پیس کردن.
(٢) مەراق پێدان. (٣) چەوساندنەوە؛ ئازاردان
(٤) سەر لێ شێواندن. (٥) دڵفڕاندن.

**-bedevilment** *(n.).*

**bedfast** (bed′fast′, bed′fäst′), *adj.* نەخۆشی ناو جێگە؛ کەفتەکار

**bedfellow** (bed′fel′ō), *n.* (١) هاوجێ؛ هاوسەرین.
(٢) ناوەڵ؛ هاوکار.

**bedim** (bi-dim′), *v.t.* کزکردن (چاو، بینایی):
***( eyes ~med with tears)***

**bedizen** (bi-dī′z'n, bi-diz′′n), *v.t.* پۆشین یا ڕازاندنەوە بە ناشرینی.

**bedlam** (bed′ləm), *n.* (١) [B-] ، شێتخانەیەکی بەناوبانگی لەندەنە.
(٢) شێتخانە. (٣) شوێنێك یا مەیخانەیەکی وەك شێتخانە.
(٤) گەرەلاوژێ؛ دەنگەدەنگ و پشێوی؛ حەمامی ژنان.
***adj.*** قەرەباڵغ و پڕ لە دەنگەدەنگ؛ وەك حەمامی ژنان.

**bedlamite** (bed′ləm-īt′), *n.* شێتی شێتخانە؛ شێت.

**bed linen,** چەرچەف و بەرگەپشتی و سەرین.

**bedmate** (bed′māt′), *n.* (١) هاوجێ؛ هاوسەر. (٢) مێرد؛ ژن.

**bed molding,** تیرمیەکی جوانی ژێر بەشێکی دەرپۆقیو (خانووسازی).

**bed of roses,** ژیانێکی خۆش و ئاسان و پڕ ئاسوودەیی.

**Bedouin** (bed′ōō-in), *n.* (١) بەدوو؛ عەرەبی کۆچەر. (٢) کۆچەر.
***adj.*** تایبەتی بە بەدوو.

**bedpan** (bed′pan′), *n.* (١) دەفرێکی سەرگیراوە پشکۆی ئاگری تێ دەکرێت و جێگەی خەوتنی پێ گەرم دەکرێتەوە. (٢) دەفری پیسایی تێکردن (بۆ نەخۆشی ناو جێگە).

**bedplate** (bed′plāt′), *n.* بن تەبەق؛ تەبەقی بناغە یا ژێرەوە.

**bedpost** (bed′pōst′), *n.* کۆڵەکەی سەرسووچی چەرپایە.

**bedraggle** (bi-drag′′l), *v.t.* پیس و قوڕاوی کردن بە ڕاکێشان بەناو قوڕدا.

**bed rest,** (١) حەوانەوەی ناو جێگە.
(٢) ئامێری بەرزکردنەوەی نەخۆش لەناو جێگەیەکدا.

**bedrid** (bed′rid′), *adj.* = bedridden.

**bedridden** (bed′rid′n), *adj.* لەناو جێگەدا کەوتوو؛ کەفتەکار.

**bedrock** (bed′rok′), *n.* (١) بەردی سەختی ژێرزەوی.
(٢) بناغەیەکی پتەو. (٣) بن؛ بنی بنەوە.
(٤) پەیڕەوی بنچینەیی یا سەرەکی.

**bedroll** (bed′rōl′), *n.* پێخەفی دەرەوە.

**bedroom** (bed′rōōm′, bed′room′), *n.* ژووری نووستن.

**bedside** (bed′sīd′), *n.* تەنیشتی جێگە؛ لای جێگە (بەتایبەتی هی نەخۆش): ***( The nurse was at his ~ constantly.)***
***adj.*** (١) تەنیشت جێگەی نووستن: ***( a ~ table)***
(٢) بەرامبەر بە نەخۆش؛ لەگەڵ نەخۆشدا: ***( a doctor's ~ manner)***

**bedsore** (bed′sôr′, bed′sōr′), *n.* برینی نەخۆشێکی کەفتەکار بەهۆی کەوتنی لەناو جێگەدا بۆ ماوەیەکی زۆر.

**bedspread** (bed′spred′), *n.* سەرەخەری جێگە (وەك پۆپەشمێن یا شتێکی جوانی وەها)؛ سەرجێگە.

**bedspring** (bed′spriŋ′), *n.* لیسپرنگی چەرپایە.

**bedstead** (bed′sted′), *n.* چەرپایە؛ قەرەوێڵە.

**bedstraw** (bed′strô′), *n.* ڕووەکێکی گوڵ زەرد یا سپی و گەڵای بێ لاسکە لە کۆندا دۆشەکی پێ دەئاخنرا.

**bedtime** (bed′tīm′), *n.* خەوتنان؛ کاتی نووستن؛ کاتی چوونە جێگە.

**bedtime stories,** (١) چیرۆکی منداڵ کردنە خەو.
(٢) چیرۆك یا باسی خۆش و باوەڕ پێ نەکراو.

**bedward** (bed′wẽrd), *adv.* بەرەو جێگەی نووستن.

**bedwards** (bed′wẽrdz), *adv.* = bedward.

**bed-wetting** (bed′wet′iŋ), *n.* مێز بە خۆدا کردن لەناو جێگەی نووستندا؛ خۆ تەڕکردن لەکاتی خەوتندا.

**bee** (bē), *n.* (١) هەنگ.
(٢) هەرەوەز؛ ملەملێ؛ پێشبڕکێ: ***( a sewing ~ ; a spelling ~ )***
**have a bee in one's bonnet,** (١) خولیای یەك شت لە مێشکدا بوون.
(٢) شێتۆکە؛ شێت.

**bee** (bē), *n.* ئەڵقە.

**beebread** (bē′bred′), *n.* نانە هەنگوین: برێتییە لە هەنگوین و هەڵاڵە هەنگەکان دەیدەن بە کرمۆکەکانیان.

**beech** (bēch), *n.* سوورەچنار؛ ڕەشەدار.

**-beechen** *(adj.).*

**bee eater,** هەنگ خۆر: باڵندەیەکی بچووکە هەنگ و جانەوەری تر دەخوات.

**beef** (bēf), *n.* (١) ڕەشەووڵاخ (بەتایبەتی هی دابەستە)؛ گا؛ مانگا.
(٢) گۆشتی ڕەشەووڵاخ؛ گۆشتی گا.
(٣) [Colloq.]، گۆشت یا ماسولکەی ئادەمیزاد.
(٤) [Colloq.]، هێز؛ ووزە.
(٥) [Slang]، سکاڵا؛ گلەیی.

*v.i.* [Slang], سکاڵاکردن.

**beef up,** [Slang], بەهێزکردن؛ بەهێزترکردن:
***( to beef up our police force)***

**beef cattle,** ڕەشەووڵاخی دابەستە بۆ سەربڕین.

**beefeater** (bēf'ēt'ēr), *n.* (١) گۆشتی گا و مانگا خۆر.
(٢) کەسێکی زل و قەڵەو و دەم و چاو سوور (لە زۆر گۆشت خواردنەوە).
(٣) پاسەوانێکی پاشای ئینگلتەرە.
(٤) پاسەوانی بورجی لەندەن (کە بەندیخانەیەکی کۆنە لە لەندەن).
(٥) [Slang]، ئینگلیزێك.

**beefsteak** (bēf'stāk'), *n.* توێیەکی گۆشتی گا و مانگا ئەوەندەی بەری لەپێك یا دووان دەبێت دەبرژێنرێت یا سووردەکرێتەوە.

**beef tea,** گۆشتاو؛ ئاوی گۆشت.

**beefy** (bēf'i), *adj.* لە گۆشت دەچێت؛ پتەو؛ ماسولکەدار.

**bee gum,** (١) کولۆرەدارێکی جەری کە هەنگ دەیکات بە پلوورە.
(٢) پلوورەهەنگی ناو کولۆرەداری جەوی.

**beehive** (bē'hīv'), *n.* (١) پلوورەهەنگ؛ پلوورە؛ پوورەهەنگ.
(٢) [Colloq.]، شوێنێکی پڕ لە جم و جووڵ و خەڵکی سەرقاڵ.

**beekeeper** (bē'kēp'ēr), *n.* خاوەن هەنگ؛ هەنگ بەخێوکەر.

**beekiller** (bē'kil'ēr), *n.* جانەوەرێکی هەنگ خۆرە.

**beeline** (bē'līn'), *n.* ڕێگەی ڕاستەوخۆ؛ ڕێگەی ڕاستەوخۆی نێوان دوو شوێن.

**make a beeline for,** [Colloq.], ڕاستەوخۆ بۆ چوون.

**been** (bin, bēn), *past participle of* **be.**

**beer** (bêr), *n.* بیرە

**beer and skittles,** خۆشی؛ کەیف و ڕابواردن؛ کەیف و خۆشی؛ بیرە خواردنەوە و یاری کردن.

**beery** (bêr'i), *adj.* (١) بیرەیی؛ وەك بیرە.
(٢) ئەنجامی بیرە خواردنەوەیە؛ سەرخۆش.

**beestings** (bēs'tiŋz), *n.* ژەك

**beeswax** (bēz'waks'), *n.* مۆم

**beet** (bēt), *n.* چەوەندەر.

**beetle** (bē't'l), *n.* قالۆنچە؛ گووخلێنکە.

**beetle** (bē't'l), *n.* (١) مێکوت (٢) دەسکی دەسکەوان و دەسکودۆڵ.
(٣) گەلاکوتك؛ چەکوشی دار (بۆ قوماش ڕێك و پێك کردن).

*v.t.* (١) کوتان (بە مێکوت یا دەسکی دەسکەوان و دەسکودۆڵ).
(٢) ڕێك و پێك کردنی قوماش بە پیامالینی ڕیشاڵەکانی.

**beetle** (bē't'l), *v.i.* دەرپۆقین؛ شۆڕبوونەوە.

*adj.* دەرپۆقیو؛ شۆڕبووەوە.

**beetle-browed** (bē't'l-broud'), *adj.* (١) برۆ پڕ و ئەستوور.
(٢) مۆن؛ ناوچەوان گرژ.

**beetlehead** (bē't'l-hed'), *n.* کەسێکی کەر و بێ مێشك.

**bee tree,** کولۆرەدارێکە هەنگ دەیکات بە پلوورە.

**beet sugar,** شەکری چەوەندەر.

**beeves** (bēvz), *n. alternative plural of* **beef.**

**befall** (bi-fôl'), *v.i.* (١) ڕوودان؛ قەومان؛ بەسەرهاتن.
(٢) [Archaic]، شیان؛ پەیوەندی پێوە بوون.

*v.t.* (١) لێ ڕوودان؛ لێ قەومان؛ بەسەرداهاتن: ***( What ~ them?)*** .
(٢) [Archaic]، شیان؛ پەیوەندی پێوە بوون.

**befit** (bi-fit'), *v.t.* شیان؛ بەجێ بوون؛ لێهاتن؛ پڕ بە پێستی بوون:
***( His fate ~s his actions.)***

**befitting** (bi-fit'iŋ), *adj.* شیاو؛ بەجێ؛ لێهاتوو.

**befog** (bi-fôg', bi-fog'), *v.t.* (١) بە تەم گرتن؛ بە تەم داپۆشین.
(٢) لێڵ کردن؛ شێواندن.

**befool** (bi-fōōl'), *v.t.* (١) خەڵەتاندن؛ چاوبەست کردن.
(٢) بە کەر دانان؛ وەك شێت سەیرکردن.

**before** (bi-fôr', bi-fōr'), *adv.* (١) لەبەردەم؛ لەپێش (جێگە).
(٢) لەوەوپێش؛ جاران؛ لە ڕابوردوودا.
(٣) بەر لە؛ لەپێش کاتێکی تایبەتیدا؛ لەپێش.

***prep.*** (١) لەپێش (کات، جێگە، پلە).
(٢) لەبەردەم؛ لەبەر: ***( He pushed ~ the door.)*** .
(٣) لەبەردەم؛ لەبەر: ***( He stood ~ the judge.)*** .
(٤) لەپێشەوە: ***( The hardest task was ~ them.)*** .
(٥) لەپێش (بەلاوە باشتربوون): ***( I'd take that book ~ this.)*** .

***conj.*** (١) لەپێش (کات)؛ بەر لە.
(٢) پێش ئەوەی: ***( He said he would die ~ he would be unfaithful to his country.)***

**beforehand** (bi-fôr'hand'), ***adv. & adj.*** پێشەکی؛ لەپێشدا؛ لەپێشەوە:
***( I knew they were coming, so I made preparations ~ .)***

**beforetime** (bi-fôr'tīm', bi-fōr'tīm'), ***adv.*** لەوەوپێش؛ جاران.

**befoul** (bi-foul'), *v.t.* (١) پیس و پۆخڵ کردن.
(٢) ئاڵۆسکاندن؛ ئاڵۆزاندن.

**befriend** (bi-frend'), *v.t.* بوون بە هاوڕێ؛ ڕوو پێدان؛ دۆستایەتی لەگەڵ گرتن؛ یارمەتیدان.

**befuddle** (bi-fud''l), *v.t.* (١) سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێواندن؛ حەپەساندن. (٢) سەرخۆش کردن.

**beg** (beg), *v.t.* (١) سواڵ کردن؛ دەست لە خەڵك پان کردنەوە.
(٢) پاڕانەوە؛ داواکردن: ***( She ~ged for mercy.)*** .
(٣) تکاکردن؛ داوای لێبووردن کردن: ***( I ~ you pardon.)*** .

***v.i.*** (١) سواڵ کردن؛ دەست لە خەڵك پان کردنەوە.
(٢) تکاکردن؛ داواکردن.

**beg off,** داوای لێبووردن کردن (بۆ جێبەجێ نەکردنی داوایەك یا بەڵێنێك):
***( He promised to help but later begged off.)***

**beg the question,** (١) پێشەکی دانانی ئەو شتە بە ڕاست کە دەویسترێت بسەلمێنرێت. (٢) خۆ نەدان بەدەستەوە؛ خۆ لادان لە باسی گران و ناخۆش.

**began** (bi-gan'), *past tense of* **begin.**

**beget** (bi-get'), *v.t.* (١) منداڵ خستنەوە؛ منداڵبوون:
***( to ~ a child)***
(٢) بوون بە هۆ" لێ کەوتنەوە" لێ بوونەوە: ***( War ~s misery and ruin.)*** .

**beggar** (beg'ēr), *n.* (١) سواڵکەر؛ دەست لە خەڵك پان کەرەوە.
(٢) کەسێکی هەژار؛ کەسێکی بێ دەرامەت.
(٣) کەسێکی نۆڵ و قومارباز (لەڕووی گاڵتەوە).

***v.t.*** (١) خستنە سواڵ
(٢) بە هیچ و پووچ و بێ سوود دەرخستن؛ شەرمەزارکردن:
***( Her beauty ~s description.)***

**beggardom** (beg'ēr-dəm), *n.* (١) سواڵکەران.
(٢) سواڵکەری؛ سواڵکەرێتی.

**beggarly** (beg'ēr-li), *adj.* (١) سواڵکەرانە؛ هەژارانە.
(٢) بۆ سواڵکەر دەشێت؛ بێ فەڕ.

**-beggarliness** *(n.).*

**beggary** (beg'ēr-i), *n.* (١) هەژاری؛ سواڵکەرێتی.

(٢) **beggardom** . (٢) سوالکەرخانە.

**begin** (bi-gin′), *v.i.* (١) دەستپێکردن (٢) هاتنەڕوو؛ پەیدابوون.

*v.t.* (١) دەستپێکردن (٢) هێنانەڕوو؛ پەیداکردن.

**beginner** (bi-gin′ẽr), *n.* نەوکار؛ تازەکوورە؛ تازە (لە کاردا).

**beginning** (bi-gin′iŋ), *n.* (١) دەستپێکردن.

(٢) سەرچاوە؛ بناغە؛ سەرەتا:

*( English democracy had its ~ in the Magna Carta.)*

(٣) سەرەتا (کات) *( In the ~ he was unsure of himself.)* .

(٤) سەرەتا *( I've read the book from ~ to end.)* .

(٥) (*pl.*)، قۆناغی یەکەم؛ سەرەتا: *( the ~s of scientific agriculture)* .

**begird** (bi-gũrd′), *v.t.* (١) پێچانەوە؛ دەورگرتن (بە پەت، تەل، شریت ... هتد) (٢) ئابلووقەدان؛ دەورەدان.

**begone** (bi-gôn′, bi-gon′), *interj. & v.i.* لاچۆ لەبەرچاوم!؛ لاچۆ!؛ برۆ!

**begonia** (bi-gōn′yə, bi-gō′ni-ə), *n.* بەگۆنیا: ڕووەکێکی گوڵ سوورو سپی‌یە بۆ جوانی لە باخچەدا دەڕوێنرێت.

**begot** (bi-got′), *past tense and alternative p.p. of* **beget.**

**begotten** (bi-got′'n), *alternative p.p. of* **beget.**

**begrime** (bi-grīm′), *v.t.* پیس‌وپۆخڵ کردن.

**begrudge** (bi-gruj′), *v.t.* (١) بوڵەبوڵ بەسەردا کردن.

(٢) بەغیلی پێ بردن (٣) پێ ڕانەبینین؛ بە ناپەدڵی‌یەوە بۆ کردن یا پێدان:

*( He ~s her every penny.)*

**beguile** (bi-gīl′), *v.t.* (١) خەڵەتاندن؛ فریودان.

(٢) لێ کێشانەوە (شت، پارە)؛ بە فێڵ لێسەندن.

(٣) کات بە خۆشی بردنەسەر. (٤) دڵفڕاندن؛ سەرنج ڕاکێشان.

**-beguilement** *(n.)*; **beguiler** *(n.)*.

**begum** (bē′gəm), *n.* ژنە موسوڵمانێکی پلەوپایە بەرز لە هیندستان و ئینگلتەرە.

**begun** (bi-gun′), *past participle of* **begin.**

**behalf** (bi-haf′, bi-häf′), *n.* سوود؛ لایەن؛ خاتر؛ ناو.

**in behalf of,** بۆ؛ لەبەر؛ لەبەر خاتری.

**on behalf of,** (١) بۆ؛ لەبەر؛ لەبەر خاتری.

(٢) بە ناوی

*( On behalf of my friends and myself I welcome you.)*

**behave** (bi-hāv′), *v.t. & v.i.* (١) ڕەووشت نوواندن؛ ڕەفتارکردن:

*( The children ~d badly.)*

(٢) ڕەووشتی جوان نوواندن؛ بە جوانی هەڵسان و دانیشتن.

**behave yourself!,** حەیات بێت!؛ بێ حەیایی مەکە!؛ عاقڵ بە!.

**behavior** (bi-hāv′yẽr), *n.* ڕەووشت؛ ڕەفتار؛ کردەوە.

**behaviorism** (bi-hāv′yẽr-iz'm), *n.* تیۆری ڕەووشت: تیۆری‌یەکە دەڵێت: کە لێکۆڵینەوەی ڕەووشتی مرۆڤ بناغەو ڕشتەی ڕاستەقینەی زانستی دەروونە

**-behaviorist** *(n.)*.

**behaviour** (bi-hāv′yẽr), *n.* = **behavior.**

**behead** (bi-hed′), *v.t.* سەربڕین؛ لە مل دان.

**beheld** (bi-held′), *past tense and p.p. of* **behold.**

**behemoth** (bi-hē′məth, bē′ə-məth), *n.* (١) ئەسپی ئاوی (٢) گیاندارێکی زل

**behest** (bi-hest′), *n.* فەرمان؛ فەرمایشت؛ ئامۆژگاری.

**behind** (bi-hīnd′), *adv.* (١) لەدواوە؛ لەپشتەوە:

*( He walked ~ .)*

(٢) لەوەوپێش؛ لەمەوپێش؛ ڕابوردوو: *( My joy lies ~ .)* .

(٣) لە شوێن یا بارێکی تردا. (٤) لەمەودوا.

(٥) دواکەوتوو (کار، ئەرک): *( He is ~ in his studies.)* .

(٦) درەنگ؛ درەنگ کەوتوو؛ دواکەوتوو: *( The train was running ~ .)* .

(٧) دواکەوتوو (قەرزدانەوە)؛ لەدواوە: *( He fell ~ in his payments.)* .

(٨) بۆ دواوە: *( looking ~ )* .

*prep.* (١) لەدوا؛ لەپاش: *( The dead leave their wealth ~ them.)* .

(٢) لەدواوە؛ لەپشتەوە: *( He sat ~ her.)* .

(٣) دواکەوتوو. (٤) درەنگ؛ دواکەوتوو: *( The train was ~ schedule.)* .

(٥) لەودیو؛ لەپشت: *( ~ the hill)* .

(٦) پشتیوان؛ لایەنگر؛ تەگبیرکەر: *( He is ~ the plan.)* .

(٧) دەرنەکەوتوو؛ نادیار: *( There is something ~ this news.)* .

*adj.* (١) دواوە؛ پشتەوە: *( the person ~ )* .

(٢) دواکەوتوو (قەرزدانەوە).

*n.* [Colloq.], سمت؛ قنگ؛ پاشەڵ؛ گووپی سمت یا قنگ.

**behindhand** (bi-hīnd′hand′), *adv. & adj.* (١) دواکەوتوو (قەرزدانەوە). (٢) دواکەوتوو (ژووان)؛ درەنگ کەوتوو؛ درەنگ هاتوو.

(٣) دواکەوتوو (شارستانێتی).

**behold** (bi-hōld′), *v.t.* سەیرکردن؛ ڕوانین؛ بینین.

*interj.* سەیرکە!؛ بڕوانە!؛ ببینە!.

**beholden** (bi-hōl′d'n), *adj.* چاوبەرەوژێر؛ قەرزاری چاکە:

*( He is ~ to you for your advice and help.)*

**behoof** (bi-hōōf′), *n.* سوود؛ خاتر.

**behoove** (bi-hōōv′), *v.t. & v.i.* (١) وا چاکە؛ پێویستە:

*( It ~s me to write him.)*

(٢) شیان؛ گونجان: *( It ~s a lady to wear black for mourning.)* .

**behove** (bi-hōv′, bi-hōōv′), *v.t. & v.i.* = **behoove.**

**beige** (bāzh), *n.* (١) قوماشێکی خوری نەرمە. (٢) ڕەنگی شەکری.

*adj.* شەکری (ڕەنگ)؛ ڕەنگی خوری.

**being** (bē′iŋ), *n.* (١) بوون؛ ژین؛ ژیان.

(٢) سرووشتی بنچینەیی کەسێك؛ گیان؛ گەوهەر.

(٣) بوونەوەر؛ گیانەوەر؛ مرۆڤ: *( a human ~ ; a divine ~ )* .

(٤) [B-]، خودا؛ یەزدان: *( the Supreme B~ )* .

(٥) (ا) بوون (فەلسەفە). (ب) ئەوەی هەیە یا بە هەبوو دادەنرێت (فەلسەفە).

**for the time being,** ئێستا؛ لەم کاتەدا:

*( For the time being , I'll stay.)*

**bejewel** (bi-jōō′əl), *v.t.* بە گەوهەر ڕازاندنەوە؛ گەوهەربەندکردن.

**belabor** (bi-lā′bẽr), *v.t.* (١) بێزارکردن؛ دارکاری کردن؛ فەلاقەکردن.

(٢) هێرش بردنە سەر بە دەم.

(٣) درێژەپێدان؛ زۆر لەسەر ڕۆیشتن: *( to ~ a point)* .

(٤) [Obs.]، خۆ پێوە ماندووکردن؛ کار لەسەر کردن.

**belated** (bi-lāt′id), *adj.* درەنگ؛ درەنگ کراو؛ لە کاتی خۆیدا نەکراو:

*( a ~ apology)*

**belay** (bi-lā′), *v.t. & v.i.* (١) قایم کردن (پەتێك بە بەستنەوەی بە سنگێکەوە)؛ چەسپاندن. (٢) [Colloq.]، بوەستە!؛ وەستاندن.

**belch** (belch), *v.i. & v.t.* (١) قرقینەدانەوە.

(٢) ( ~ **forth** )، قسەی ناشرین کردن؛ جوێن دان. (٣) ڕشانەوە.

(٤) هاویشتن؛ پژان: *( The volcano ~ed fire and lava.)* .

*n.* (١) قرقینە. (٢) شتی ڕشاوە؛ شتی پژاو یا هاوێژراو (وەك ئاگرپژێن).

**beldam** (bel′dəm), *n.* (١) پیرێژن. (٢) پیرێژنێکی ناشرین.

(٣) [Obs.]، داپیرە؛ دایەگەورە.

**beldame** (bel′dəm, bel′dām), *n.* = **beldam.**

**beleaguer** (bi-lē′gẽr), *v.t.* (١) گەمارۆدان (بە لەشکر)؛ دەورەدان؛ ئابلووقەدان. (٢) هەراسان کردن؛ هێرش بردنە سەر لە هەموولایەکەوە.

**belfry** (bel′fri), *n.* (١) بورجی زەنگی کڵێسە.

(٢) تەوقەسەری بورجە کە زەنگەکەی پێدا هەڵواسراوە.

**Belgian** (bel′jən, bel′ji-ən), *adj.* بەلجیکی (گەل، کلتوور، زمان).

*n.* هاووڵاتی‌یەکی بەلجیکی.

**Belial** (bē′li-əl, bēl′yəl), *n.* (١) بەدی؛ بەدخوازی؛ ناپەسەندی.

(٢) شەیتان.

**belie** (bi-lī′), *v.t.* (١) درۆکردن دەربارەی؛ ڕاستی دەرنەبڕین؛ ڕاستی شاردنەوە: ***( His cheerful appearance ~d his feelings.)*** .

(٢) هیوا بڕین: ***( War ~d hopes for peace.)*** .

(٣) بەدرۆخستنەوە: ***( His deeds ~ his words.)*** .

**belief** (bə-lēf′), *n.* (١) بڕوای ئاینی: ***( a ~ in God)*** .

(٢) بڕوا؛ باوەڕ ***( I have ~ in his ability.)*** .

(٣) بڕواپێکردن؛ جێی بڕوابوون: ***( a claim beyond ~ )*** .

(٤) شتێکی بڕواپێکراو. (٥) ڕا؛ وازانین؛ ڕابینین.

(٦) ڕێڕەو (ئاینی، ڕامیاری، فەلسەفی... هتد).

**believable** (bə-lēv′ə-b′l), *adj.* بڕوای پێ دەکرێت؛ ڕێی تێ دەچێت.

**believe** (bə-lēv′), *v.t.* (١) بڕوا پێ بوون (پەیمان)؛ بڕواپێکردن.

(٢) لاوابوون؛ وازانین؛ وادانان.

*v.i.* (١) بڕوا پێ بوون: ***( He ~s in everything that you say.)*** .

(٢) بڕوابوون (بە ئاین). (٣) ڕا وابوون.

**believe in,** بڕوا پێ بوون: ***( He believes in God.)*** .

**believer** (bə-lēv′ēr), *n.* (١) بڕواکەر؛ بڕوادار.

(٢) خواناس؛ ئایندار؛ بڕواهەبوو بە ئاین.

**belike** (bi-līk′), *adv.* [Archaic], لەوانەیە؛ بۆی هەیە.

**belittle** (bi-lit″l), *v.t.* (١) بچووك کردنەوە؛ کەمکردنەوە.

(٢) لە پلەوپایە کەمکردنەوە؛ بە کەم دانان؛ سووك کردن:

***( to ~ somebody)***

**bell** (bel), *n.* (١) زەنگ؛ زیل؛ زەنگولە. (٢) زەنگ لێدان؛ دەنگی زەنگ.

(٣) شتێکی لە زەنگ چوو (وەك گوڵ). (٤) (*pl.*)، ئامێرێکی مۆسیقاییە.

*v.t.* (١) زەنگ پێوەکردن؛ زەنگ پێوەهەڵواسین.

(٢) لە شێوەی زەنگدا دروستکردن.

**bell** (bel), *n., v.i. & v.t.* نەڕە؛ بۆڕە؛ نەڕاندن؛ بۆڕاندن.

**belladonna** (bel′ə-don′ə), *n.* (١) ڕووەکێکی ژەهراوییە.

(٢) دەرمانێکە لەم ڕووەکە دەردەهێنرێت.

**bellboy** (bel′boi′), *n.* بەردەستی میوانخانە (جانتای میوان هەڵدەگرێت و وردە ئیشی سەرپێیی دەکات).

**bell buoy,** سەرئاوکەوتووی زەنگدار: شتێکی سووکە ئەوەندەی دەبێت کە سەرئاوکەوتووە بۆ ڕێ پیشاندانی کەشتی لەنزیك قەراغی دەریا زەنگەکەی شەپۆل لێی دەدات.

**belle** (bel), *n.* (١) کچێك یا ژنێکی زۆر جوان.

(٢) جوانترین ئافرەتی شوێنێك یا ئاهەنگێك: ***( the ~ of the ball)*** .

**belles-lettres** (bel′let′rə), *n.pl.* وێژە (هۆنراوە و چیرۆك و پەخشان و شانۆگەری).

**-belletrist** *(n.)*; **belletristic** *(adj.)*.

**bellflower** (bel′flou′ēr), *n.* گوڵەزەنگی؛ ڕووەکێك کە ئەم گوڵە دەگرێت

**bellhop** (bel′hop′), *n.* [Slang], = **bellboy.**

**bellicose** (bel′ə-kōs′), *adj.* شەڕانی؛ شەڕەنگێز؛ شەڕفرۆش.

**-bellicoseness** *(n.)*.

**bellicosity** (bel′ə-kos′ə-ti), *n.* شەڕەنگێزی؛ شەڕفرۆشی؛ جەنگاوەری.

**bellied** (bel′id), *adj.* (١) ووردار. (٢) وورگن؛ وورگ زل.

**belligerence** (bə-lij′ēr-əns), *n.* (١) شەڕەنگێزی؛ جەنگاوەری؛ شەڕفرۆشی. (٢) جەنگ؛ شەڕ.

**belligerency** (bə-lij′ēr-ən-si), *n.* (١) لە شەڕدا بوون.

(٢) **belligerence** .

**belligerent** (bə-lij′ēr-ənt), *adj.* (١) لە شەڕدایە؛ لە جەنگدایە:

***( the ~ powers)***

(٢) شەڕەنگێز؛ شەڕفرۆش؛ شەڕانی؛ جەنگاوەر:

***( a ~ person, country, etc.)***

(٣) جەنگی؛ تایبەتی بە جەنگ یا شەڕ.

*n.* (١) کەسێك، کۆمەڵێك یا وڵاتێك کە لە شەڕدا بێت.

(٢) کەسێك، کۆمەڵێك، یا وڵاتێکی شەڕەنگێز.

**bell jar,** سەرقەپاغ یا دەفرێکی شووشەیە وەك زەنگ وایە.

**bellman** (bel′mən), *n.* جارچی.

**bellmouthed** (bel′mouthd′, bel′moutht′), *adj.* دەمەکەی لە دەمی زەنگ دەچێت.

**bellow** (bel′ō), *v.i.* (١) بۆڕاندن؛ قۆڕاندن. (٢) نەڕاندن؛ قیژاندن.

(٣) گریان بە دەنگی بەرز؛ هاوار هاوار کردن.

*v.t.* بە دەنگی بەرز و قایم وتن؛ هاوارکردن.

*n.* (١) بۆڕە؛ قۆڕە. (٢) نەڕە؛ هاوار؛ قیژە؛ شریخە.

**bellows** (bel′ōz, bel′əz), *n. sing. & pl.* مووشەدەمە؛ کوورەدەمە.

**bell pepper,** بیبەر؛ دەلوبیبەر.

**bellwether** (bel′weth′ēr), *n.* (١) پێشەنگی مێگەل؛ بەرانی زەنگ لەملی پێشەنگی ڕان. (٢) سەرگەورە؛ سەردەستە؛ سەرۆك.

**belly** (bel′i), *n.* (١) وورگ؛ سك. (٢) ژێرسکی وڵاخ و گیانداری تر.

(٣) پڕ وورگێك. (٤) ناوجەرگە یا ناوی ناوەوە: ***( the ~ of a ship)*** .

(٥) شوێنێکی دەرپۆقیو؛ ئاوساوی. (٦) پێشەوە؛ بنەوە؛ بن؛ ژێرەوە.

(٧) [Obs.]، منداڵدان؛ پزدان.

*v.t. & v.i.* دەرپۆقین؛ ئاوسان.

**bellyache** (bel′i-āk′), *n.* سك ئێشە.

*v.i.* [Slang], سکاڵاکردن.

**bellyband** (bel′i-band′), *n.* (١) تەنگە (وڵاخی بار و سوارە).

(٢) پشتێن (بۆ بەهێزکردنی ماسولکەی سکی منداڵ).

**bellybutton** (bel′i-but′′n), *n. Also* **belly button,** ناوك.

**belly dance,** سەمای عەرەبی.

**bellyful** (bel′i-fool′), *n.* (١) پڕ سکێك؛ ئەوەندەی تێری پێ بخورێت و زیاتریش. (٢) [Slang]، ئەوەندەی حەزی پێ بکرێت و زیاتریش؛ سەروزیاد؛ زۆر (شت).

**belly laugh,** [Slang], (١) پێکەنینێکی گەرم و بەدڵ؛ پێکەنینێکی زۆر.

(٢) شتێك کە خەڵك زۆر بهێنێتە پێکەنین.

**belong** (bi-lôŋ′, bi-loŋ′), *v.i.* شیان؛ گونجان؛ بەشێك بوون لە؛ باش بوون بۆ: ***( I don't ~ here. ; She ~s in the movies.)*** .

**belong to,** (١) تایبەتی بە؛ هی: ***( The book belongs to me.)*** .

(٢) ئەندام بوون (یانە، ڕێکخراو): ***( She belongs to several clubs.)***

**belonging** (bi-lôŋ′iŋ, bi-loŋ′iŋ), *n.* (١) (*pl.*)، کەلوپەلی خۆ؛ شتومەکی تایبەتی کەسێك:

***( I hope you've left none of your ~s in the hotel.)***

(٢) (*pl.*)، [Colloq.]، خزم؛ خزم و کەس وکار.

(٣) هەستکردن بە نزیکی و بەشداری کردن: ***( to have a sense of ~ )***

**beloved** (bi-luv′id, bi-luvd′), *adj.* خۆشەویست؛ شیرین.

*n.* کەسێکی زۆر خۆشەویست و شیرین.

**below** (bi-lō′), *adv. & adj.* (١) لەژێر؛ ژێر؛ لەخوار؛ لەبن؛ بن.

(٢) لەخوارەوە (لاپەڕە): ***( See the explanation ~ .)*** .

(٣) لە دۆزەخدا. (٤) لەسەر زەوی. (٥) لە نهۆمێکی خوارتر یا خوارەوە

(٦) لەخوار (پلەوپایە).

*prep.* (١) لەخوار (پلەوپایە، بایەخ، نمرە، نرخ، شوێن):

***( ~ the line ; ~ the horizon ; ~ the average ; A captain is ~ a general in rank.)***

(٢) نەشیان؛ لێ نەهاتن: ***( It is ~ your dignity to do such a thing.)*** .

**belt** (belt), *n.* (١) پشتێن؛ قایشی پشتێن؛ قایش.

(٢) قایشی بزۆکی شت گواستنەوە؛ قایشی شت گوێزەرەوە.

(٣) قایش (مەکینە).

(٤) ناوچەیەکی بە شتێك ناسراو: ***( the corn ~ )*** .

(٥) ڕێگەیەکە بەدەوری شاردا: *( a beltway)* .
(٦) [Slang]، مستەکۆڵە؛ زرمە. (٧) [Slang]، پێکێك خواردنەوە.

*v.t.* (١) دەوردان (وەك بە پشتێن).
(٢) بەستنەوە یا قایم کردن (وەك بە پشتێن یا قایش).
(٣) قامچی لێدان؛ لێدان یا پیاکێشان بە قایش.
(٤) [Slang]، بەتوندی لێدان؛ بە قایم پیاکێشان.

**below the belt,** لەخوار ناوقەدەوە (بۆکس لێدان لە بۆکسبازیدا کە قەدەغەیە)؛ نارەوا؛ نادەستووری: *( to hit below the belt)* .

**tighten one's belt,** دەست بە پارە یا شتەوە گرتن؛ دەست بە خۆوە گرتن و پارە بەفیڕۆنەدان

**under one's belt,** لەچنگدایە؛ دەست کەوتووە؛ بەجێهێنراوە.

**belt highway,** شاڕێگەیەکە بەدەوری شارێکدا.

**belting** (bel′tiŋ), *n.* (١) شتی قایش یا پشتێن لێ دروستکردن.
(٢) قایش؛ پشتێن؛ پشتێنەکان. (٣) [Slang]، قامچی لێدان؛ بیرازکردن.

**belt line,** ڕێگا یا هێڵی شەمەندەفەر یا پاسی بازنەیی ناوشار.

**beluga** (bə-lōō′gə), *n.* دۆلفینی سپی (لە دەریای بەستەڵەکدا دەژی).

**belvedere** (bel′və-dêr′), *n.* خانوویەکی هاوینەیە بە بەرزاییەکەوە کە دیمەنی جوانی لێوە دیاربێت؛ باڵکۆن.

**bema** (bē′mə), *n.* (١) دووانگە. (٢) پێش نوێژگای کەنیشتە.
(٣) سەکوی دەوروپشتی قوربانیگا (کڵێسە).

**bemazed** (bi-māzd′), *adj.* سەرسووڕماو؛ سەر لێ شێواو؛ سەرسام.

**bemean** (bi-mēn′), *v.t.* سووك کردن؛ لە پلە نزم کردنەوە.

**bemire** (bi-mīr′), *v.t.* (١) قوڕاوی کردن؛ پیس کردن.
(٢) لە قوڕدا چەقین.

**bemoan** (bi-mōn′), *v.t. & v.i.* شین بۆ کردن؛ بۆ گریان؛ داخ بۆ خواردن؛ زۆر سکاڵاکردن: *( to ~ one's fate)* .

**bemock** (bi-mok′), *v.t.* گاڵتەپێکردن؛ قەشمەری پێکردن؛ کلك پێوەکردن.

**bemuse** (bi-mūz′), *v.t.* سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان.

**bemused** (bi-mūzd′), *adj.* (١) سەر لێ شێواو؛ سەر لێ تێکچوو.
(٢) لە بیری قووڵدایە؛ داڵغەی لێداوە؛ چووەتە ژێری.

**ben** (ben), *n.* کوڕ.

**ben** (ben), *n.* لووتکە شاخ

**ben** (ben), *n.* تۆوی درەختێکە بۆنی خۆشی لێ دەردەهێنرێت

**ben** (ben), *adv., prep. & adj.* ناوەوە؛ ناوەکی؛ تایبەتی بە ناوەوە

*n.* ژووری ناوەوە.

**bename** (bi-nām′), *v.t.* [Archaic], ناونان؛ ناولێنان؛ پێ ووتن.

**bench** (bench), *n.* (١) تەختەیەکی درێژی بێ پشتی دانیشتنە؛ تەختەی دانیشتن. (٢) مێزی نیش کردن (دارتاشی).
(٣) بەستوو یا تیرەی قەراغ ڕووبارو دەریاچە.
(٤) کورسی سەگ لەسەر نوواندن لە پیشانگای سەگدا.
(٥) تیرە زەوییەکی تەخت و باریك و بەرز (٦) کورسی دادپرس.
(٧) پلەوپایەو دەسەڵاتی دادپرس (٨) دادپرسان؛ دادگەران. (٩) دادگا.

*v.t.* (١) تەختەی درێژو بێ پشتی دانیشتن تێدا دانان.
(٢) دانان بە دادگەر؛ دامەزراندن بە دادپرس
(٣) نوواندن لە پیشانگادا (سەگ).
(٤) لە یاری دەرکردن یا لێخستنی یاریکەرێك لەکاتی یاری کردندا.

**on the bench,** (١) دادپرسی دەکات؛ دادگەرە.
(٢) ڕێی یاری کردنی پێ نەدراوەو هەر دانیشتووە.

**bench mark,** نیشانەی زەوی پێوان.

**bench show,** پیشانگای گیانداری بچووك (بەتایبەتی سەگ).

**bench warrant,** فەرمانی دادپرس بە گرتنی کەسێك.

**bend** (bend), *v.t.* (١) نووشتاندنەوە؛ چەماندنەوە؛ خوارکردن؛ پساندن.
(٢) دانەواندنەوە؛ دانەواندن.
(٣) پێچ پێکردنەوە؛ لادان لە ڕێگە.
(٤) بادان؛ گۆڕین؛ نووشتاندنەوە (مەجاز):
*( He bent the prisoner's will to his wishes.)*
(٥) گوێ پێدان؛ سەرنج پێدان.

*v.i.* (١) پێچکردنەوە؛ بادانەوە.
(٢) چەمانەوە؛ نووشتانەوە؛ خواربوونەوە:
*( The branch bent when he climbed on to it, but didn't break.)*
(٣) دانەوینەوە؛ دانەوین؛ چەمینەوە:
*( Can you ~ down and touch your toes, but without ~ing your knees?)*
(٤) خۆ بەدەستەوەدان؛ چەمینەوە بەرەو: *( He bent to her whishes.)*
(٥) سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان.

*n.* (١) پێچ: *( There is a ~ in the road.)* .
(٢) چەمانەوە؛ نووشتانەوە؛ شوێنی چەماوە؛ چەوتی.

**bend** (bend), *n.* گرێ (پەت یا گوریسی کەشتییەوان).

**the bends, [Colloq.],** باپێچ (سك).

**beneath** (bi-nēth′), *adv. & adj.* لەژێرا لەخوار؛ لەبن.

*prep.* (١) لەژێرا لەبن: *( ~ a blanket of snow)* .
(٢) نزمتر (پلە)؛ لەخوار.
(٣) نەشیان؛ لێ نەهاتن: *( It is ~ him to cheat.)* .

**benedicite** (ben′ə-dis′ə-ti), *interj.* دوعاکردن و لە خوا پاڕانەوە لەپێش و پاش نان خواردندا.

**benedict** (ben′ə-dikt′), *n.* (١) تازە زاوا (لەپاش زوگورتێتییەکی نۆر). (٢) پیاوی ژندار.

**benediction** (ben′ə-dik′shən), *n.* (١) پیرۆزکردن.
(٢) پیرۆزکردن (لەلایەن قەشەوە لەکۆتایی نوێژدا)؛ دوعا بۆ کردن.
(٣) سوپاسی خودا کردن؛ دوعاکردن. (٤) پیرۆزی.

-**bendictive; benedictory** *(adj.).*

**benefaction** (ben′ə-fak′shən), *n.* (١) خێرکردن.
(٢) خێر؛ سایە.

**benefactor** (ben′ə-fak′tēr), *n.* خێرکەر؛ پارمەدەر بە نەخۆشخانە، قوتابخانە، دەزگایەکی کۆمەڵایەتی، یا مرۆڤێك لەڕووی چاکەو یارمەتییەوە؛ سایەدار.

**benefactress** (ben′ə-fak′tris), *n.* خێرکەری ژن (ووشەی پێشوو ببینە).

**benefic** (bə-nef′ik), *adj.* = **beneficent.**

**benefice** (ben′ə-fis), *n.* (١) زەوییەکی بە کرێ گیراوە لە دەرەبەگێك کە لەباتی کرێ دان وەرزێرەکە نیش بۆ دەرەبەگەکە بکات.
(٢) فەرمانبەرێتییەکی کڵێسەیە کە فەرمانبەرەکە بە دەسکەوتی زەوی کڵێسەکە بژی. (٣) دەسکەوتی ئەم زەوییانەی کڵێسە.

*v.t.* کاربەدەستییەکی کڵێسە پێدان بە زەوی کڵێسەکەوە.

**beneficence** (bə-nef′ə-s′ns), *n.* (١) خێرکردن؛ چاکەکردن؛ چاکەکاری؛ بەبەزەییتی (٢) خێر؛ چاکە؛ کارێکی چاکە.

**beneficent** (bə-nef′ə-s′nt), *adj.* (١) چاکەکەر؛ خێرکەر؛ بەخشندە.
(٢) بەسوود؛ بەکەڵك.

**beneficial** (ben′ə-fish′əl), *adj.* (١) بەکەڵك؛ بەسوود؛ باش:
*( Fresh air and sunshine are ~ to health.)*
(٢) سوود وەرگر؛ کەڵك وەرگر.

**beneficiary** (ben′ə-fish′ēr-i), *n.* (١) بەروبووم خۆری زەوی کڵێسە یا زەوی بە کرێ گیراو لە دەرەبەگ. (٢) سوودبەر؛ بەرخۆر.
(٣) میراتبەر؛ وەرگری بژاردنەوە (لەلایەن کۆمپانیای بیمەوە).

**benefit** (ben′ə-fit), *n.* (١) چاکە؛ خێر؛ کارێکی چاکە.
(٢) کەڵك؛ سوود: *( The book wasn't of much ~ to me.)*
(٣) *(pl.)*، بژاردن (کۆمپانیای بیمە)؛ پارەی دابەشکراو بەسەر هەژارو بێ دەرامەتەکاندا لەلایەن میری یا دەزگایەکی خێرکەرەوە.

(٤) ئاهەنگێك یا پیشانگایەك كە دەسكەوتەكەی بۆ كەسێك، كۆمەڵێك، یا پرۆژەیەكی تایبەتییە: *( a ~ concert)* .

*v.t.* سوود پێ بەخشین؛ یارمەتیدان: *( The sea air will ~ you.)* .

*v.i.* سوود لێ وەرگرتن؛ كەڵك لێ وەرگرتن:

*( He ~ted from the medicine the doctor gave him.)*

**benefit of clergy,** (١) مافی پاراستنی كاربەدەستانی كڵێسە كە بریتی بوو لە دانیان بە دادگای كڵێسە نەك بە دادگای ئاسایی ئەگەر تاوانێكیان بكردایە. (٢) پەسەندی كڵێسە؛ ڕەزامەندی كڵێسە:

*( Their marriage was without benefit of clergy.)*

**benefit of the doubt,** بەخشین لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو بۆ تاوانباركردن:

*( Sometimes it is a good idea to give a person the benefit of the doubt.)*

**benefit society** (or **association**), كۆمەڵێكی هەرەوەزییە بۆ یارمەتیدانی ئەندامەكانی لەكاتی نەخۆشی و لێقەوماندا.

**benevolence** (bə-nev′ə-ləns), *n.* (١) دڵ و دەروون پاشی؛ بەزەیی؛ دڵنەرمی؛ چاكی. (٢) كارێكی چاكە؛ چاكە؛ خێر. (٣) باربووی زۆرەملێ (كە پاشای ئینگلتەرە لە خەڵكەكەی كۆدەكردەوە).

**benevolent** (bə-nev′ə-lənt), *adj.* چاكەكار؛ دڵ و دەروون چاك؛ بەبەزەیی؛ دڵنەرم.

**Bengalese** (ben′gə-lēz′, beŋ′gə-lēz′), *adj.* بەنگالی (گەل، زمان، كلتوور).

*n.* هاوولاتییەكی بەنگالی.

**Bengali** (ben-gôl′i, beŋ-gôl′i), *n.* (١) هاوولاتییەكی بەنگالی. (٢) زمانی بەنگالی.

*adj.* بەنگالی (گەل، زمان، كلتوور).

**benighted** (bi-nīt′id), *adj.* (١) تاریك؛ لە تاریكیدایە. (٢) لە تاریكیدا ژیاو (شارستانیێتی)؛ دواكەوتوو.

**benign** (bi-nīŋ′), *adj.* (١) دڵ و دەروون باش؛ دڵپاك؛ بەبەزەیی؛ باش. (٢) بەكەڵك؛ بەسوود. (٣) نەكوژ؛ بێ زیان (پزیشكەوانی)؛ بێ وەی: *( a ~ tumor)* .

**benignant** (bi-nig′nənt), *adj.* (١) بەبەزەیی؛ دڵنەرم؛ باش؛ ناسك. (٢) بەكەڵك؛ بەسوود.

**benignity** (bi-nig′nə-ti), *n.* (١) دڵنەرمی؛ بەزەیی؛ دڵپاكی؛ دڵ و دەروون چاكی. (٢) چاكە؛ كارێكی چاكە.

**benison** (ben′ə-z′n, ben′ə-s′n), *n.* = **benediction.**

**benjamin** (ben′jə-min), *n.* درەختێكە ماددەیەكی وەك جەوی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی و بۆن.

**bent** (bent), *adj.* (١) چەوت؛ خوار؛ نووشتاوە؛ چەماوە. (٢) سوور لەسەر: *( She is ~ on going.)* . (٣) بەرەو؛ لەسەر ڕێگەیە بەرەو: *( travelers westward ~ )* .

*n.* (١) مەیل؛ حەز؛ توانای مێشكی: *( a ~ for music)* . (٢) [Archaic]، گوژم؛ پاڵ.

**to (or at) the top of one's bent,** بەوپەڕی تواناوە.

**bent** (bent), *n.* (١) لاسكی هەندێك گوڵ. (٢) ڕووەكێكە لە قەڕەم دەچێت. (٣) جۆرە گیایەكی تەرز فرێندەرە. (٤) [Archaic]، دەشتێكی بنچكاوی.

**benthos** (ben′thos) *n.* ڕووەك و گیانداری بن دەریا.

**-benthic** *(adj.)*; **benthonic** *(adj.).*

**benumb** (bi-num′), *v.t.* (١) سڕكردن. (٢) مراندن یا سڕكردنی هەست و بیرو هۆش.

**benzine** (ben′zēn, ben-zēn′), *n.* بەنزین

**benzoic acid,** ترشەڵۆكی بەنزەویك.

**benzoin** (ben′zō-in, ben-zō′in, ben′zoin), *n.* (١) جەوی جۆرە درەختێكە دەكرێت بە دەرمان و بۆن. (٢) ئەم درەختە.

**Beowulf** (bā′ə-woolf′), *n.* قارەمانی كۆنترین داستانی زمانی ئینگلیزی هەمان ناوە.

**bequeath** (bi-kwēth′, bi-kwēth′), *v.t.* (١) میراتی بۆ بەجێهێشتن بە وەسیەتنامە. (٢) بەجێهێشتن بۆ نەوە (ناوبانگ، زیرەكی).

**bequest** (bi-kwest′), *n.* (١) بۆ بەجێهێشتن (میراتی، ناوبانگ). (٢) شتی بۆ بەجێماو (میراتی، ناوبانگ، زیرەكی).

**berate** (bi-rāt′), *v.t.* سەرزەنشت كردن؛ شكاندن؛ پیاهەڵشاخان.

**Berber** (būr′bēr), *n.* (١) بەربەر: ئەندامی خێڵێكی موسوڵمانی سەرووی ئەفەریقایە. (٢) زمانی بەربەری.

*adj.* بەربەری (خێڵ، زمان، كلتوور).

**berceuse** (bâr′söz′), *n.* لایلایە.

**bereave** (bi-rēv′), *v.t.* (١) بێبەش كردن (لە خۆشی، ئومێد، ژیان). (٢) لێسەندنەوەی كەسێكی خۆشەویست بە مردن:

*( to be ~d of one's parents, children, friends, etc.)*

**bereavement** (bi-rēv′mənt), *n.* (١) بێبەش بوون لە خۆشی ژیان. (٢) جەرگ سووتان؛ مردنی خزمێكی نزیك؛ لێقەومان:

*( We all sympathise with you in your ~ .)*

**bereft** (bi-reft′), *adj.* بێبەش؛ بێبەش كراو؛ جەرگ سووتاو؛ لێقەوماو؛ غەمبار: *( ~ of hope, home, family, and friends)*

**beret** (bə-rā′, ber′ā), *n.* (١) تەپلەیەكی خڕو سەرپان و نەرم و پڕ بە پڕی سەرە (وەك هی سەربان). (٢) **biretta** .

**berg** (būrg), *n.* = **iceberg.**

**bergamot** (būr′gə-mot′), *n.* (١) جۆرە هەرمێیەكە. (٢) جۆرە لیمۆیەكە ڕۆنی توێكڵەكەی دەكرێت بە گوڵاو. (٣) ئەم ڕۆنە. (٤) جۆرێكە لە پونگە.

**berhyme, berime** (bi-rīm′), *v.t.* (١) هەڵبەست پیاهەڵدان. (٢) قەشمەری پێكردن لە هۆنراوەدا.

**beriberi** (ber′i-ber′i), *n.* نەخۆشییەكە بەهۆی كەمیی ڤیتامین " بی " لە لەشدا تووشی مرۆڤ دەبێت و دەبێتە هۆی لاوازی و كەمیی خوێن.

**berlin** (bēr-lin′, būr′lin), *n.* (١) گالیسكەیەكی چوارپێچكەیی سەر داخراوە. (٢) ئوتومبیلێكە كورسی پێشەوەو دواوەی بە پارچەیەك شووشە جیاكراوەتەوە. (٣) جۆرێكە لە قوماشی خوری.

**berm, berme** (būrm), *n.* (١) بارێكە قەراغی ڕێیەكی قیرتاوكراوە. (٢) تیرە خاكێكی بارێكە لەنێوان دیواری سەنگەرێك و خەنەقی دەوری دیوارەكەدا.

**berretta** (bə-ret′ə), *n.* = **biretta.**

**berry** (ber′i), *n.* (١) تووترك؛ شاتوو؛ توو؛ شلیك. (٢) دەنكی هەندێك ڕووەكە وەك قاوە. (٣) هێلكەی " لۆبستەر " كە گیاندارێكی ئاوییە وەك قرژاڵ. (٤) [Slang]، دۆلار. (٥) میوەیەكی گۆشتن و پێست یا توێكڵدارە (وەك تەماتە، ترێ، مۆز).

**berseem** (bēr-sēm′), *n.* سێپەرە؛ وێنجە.

**berserk** (būr′sērk, bēr-sūrk′), *n.* كەسێكی قوشقی؛ كەسێكی شێت و هاربوو.

*adj. & adv.* قوشقی؛ شێت و هار.

**berserker** (būr′sēr-kēr, bēr-sūr′kēr), *n.* (١) شەڕكەرێكی ئەسكەندینافی كۆن كە خۆی قوشقی دەكرد پێش چوونە ناو جەنگەوە. (٢) كەسێكی قوشقی؛ كەسێكی شێت و هار.

**berth** (būrth), *n.* (١) مۆڵگەی كەشتی و بەلەم؛ لەنگەرگای كەشتی. (٢) كاری سەر كەشتی؛ كاربەدەستێتی سەر كەشتی. (٣) چەرپایەی چەسپوی ناو كەشتی یا شەمەندەفەر؛ جێگەیەكی نووستنی تەسكی ناو شەمەندەفەرو كەشتی.

*v.t.* (١) لەنگەرهاویشتن؛ بەستنەوەی كەشتی و بەلەم لە لەنگەرگادا. (٢) جێگەی نووستن پێدان لەناو كەشتی یا شەمەندەفەردا.

*v.i.* لەنگەرهاویشتن.

**give a wide berth to,** لێ دووركەوتنەوە؛ خۆ لێ دووركرتن.

**bertha** (bûr′thə), *n.* یەخەی پانی کراسی ژنان.

**Bertillon system,** ڕێگای ناسین و دۆزینەوەی تاوانباران بەهۆی درێژی و نیشانەی تایبەتی کەسی و شوێن پەنجە.

**beryl** (ber′il), *n.* بەردێکی بەنرخی سەوزە.

**beseech** (bi-sēch′), *v.t.* پاڕانەوە؛ لێ پاڕانەوە؛ تکالێکردن.

**beseem** (bi-sēm′), *v.i.* شیان؛ لێهاتن؛ بەجێبوون.

**beset** (bi-set′), *v.t.* (١) پەلاماردان لە هەمولایەکەوە. (٢) هەراسان کردن؛ پەستکردن: *( Frightened and ~ by doubts)*. (٣) گەمارۆدان؛ ئابلووقەدان؛ کردنە کونەوە. (٤) داپۆشین یا پڕکردن لە گەوهەر.

**besetting** (bi-set′iŋ), *adj.* هەراسانکەر؛ هەمیشە پەستکەر.

**beshrew** (bi-shrōō′), *v.t.* [Archaic]. لەعنەت لێکردن

**beside** (bi-sīd′), *prep.* (١) لەتەنیشت؛ لەلا؛ لەپاڵ؛ بەپاڵ. (٢) لەچاو *( B~ yours my share seems small.)*. (٣) زیاد لە؛ لەوەش بەولاوە؛ سەرەڕا. (٤) پەیوەندی پێوە نییە؛ دوورە لە؛ جیاواز: *( That is ~ the point.)*.

*adv.* سەرەڕا؛ زیاد لە؛ هەروەها.

beside oneself, تووڕە؛ زویر؛ پەست.

**besides** (bi-sīdz′), *adv.* (١) هەروەها؛ سەرەڕای؛ زیاد لە. (٢) تر؛ هی تر؛ لەوە بەولاوە.

*prep.* (١) هەروەها؛ سەرەڕای؛ زیاد لە. (٢) بێجگە لە؛ جگە لە.

**besiege** (bi-sēj′), *v.t.* (١) گەمارۆدان؛ ئابلووقەدان؛ دەورگرتن: *( The town was ~d for a year.)* (٢) داگرتنەوە (بە پرسیار یا خواست) *( They ~d us with questions.)*. (٣) دەورەدان؛ دەوروپشت دان.

-besiegement *(n.)*.

**besmear** (bi-smêr′), *v.t.* (١) تێهەڵسوون (پیسی، بۆیە، شتی لینج)؛ پیس کردن. (٢) لەکەدارکردن؛ پیس کردن (ناوبانگ).

**besmirch** (bi-smûrch′), *v.t.* (١) پیس کردن. (٢) لەکەدارکردن؛ پیس کردن (ناو، ناوبانگ)

**besom** (bē′zəm), *n.* (١) گسک. (٢) پاککەرەوە؛ خاوێنکەرەوە. (٣) دەوەنێکی گەڵا ووردی لق باریکی گوڵ ڕەنگینە.

**besot** (bi-sot′), *v.t.* (١) سەر لێ تێکدان (بە خواردنەوە)؛ سەرخۆش-کردن؛ سەر لێ شێواندن. (٢) شێت وشەیدا کردن؛ مێشك تێکدان.

**besought** (bi-sôt′), *past tense and p.p. of* beseech.

**bespangle** (bi-spaŋ′g′l), *v.t.* ڕازاندنەوە بە شتی بریقەدار.

**bespatter** (bi-spat′ẽr), *v.t.* (١) قوڕ بیادان؛ قوڕ لێ هەڵپرژاندن؛ پیس کردن. (٢) لەکەدارکردن؛ ناو پیس کردن بە تاوانی درۆ.

**bespeak** (bi-spēk′), *v.t.* (١) شوێن گرتن (ژووری میوانخانە، سینەما ... هتد)؛ پێشەکی داواکردن. (٢) پیشاندان؛ وا دەرخستن؛ نیشانەی ئەوەبوون. *( His actions ~ a generous nature.)* (٣) نیشانەی دواڕۆژ بوون؛ بۆ ڕاندن. (٤) [Archaic or Poetic]. ووتاردان؛ قسە بۆ کردن.

**bespoke** (bi-spōk′), *past tense and p.p. of* bespeak.

*adj.* [British], (١) دەستدروو؛ دەستکرد (بەپێی خواستی کڕیار). (٢) پێشەکی داواکراو (جل وبەرگی بە دەست دووراو، شتی دەستکرد).

**bespoken** (bi-spōk′′n), *alternative p.p. of* bespeak.

**bespread** (bi-spred′), *v.t.* بەسەردا بلاوکردنەوە؛ بە ئەستووری بەسەرداکردن و داپۆشینی (شلە).

**besprinkle** (bi-spriŋ′k′l), *v.t.* لێ هەڵپرژاندن؛ ئاو لێ هەڵپرژاندن؛ پێوەکردن

**best** (best), *adj.* (١) باشترین؛ چاکترین. (٢) زۆربەی؛ بەشی زۆری: *( It took the ~ part of an hour to do this.)* (٣) لە هەموو کات باشتر؛ تەندرووستترین: *( He feels ~ in the morning.)*

*adv.* (١) باشترین شێوە؛ چاکترین. (٢) ئەوپەڕ؛ زیاترین.

*n.* (١) باشترین (کەس، پیشەچی): *( He is among the ~ in his profession.)* (٢) باشترین (شت، بار، کار). (٣) ئەوپەڕی توانا: *( He did his ~ .)*. (٤) بەزاندن؛ بەسەردا زاڵبوون: *( She got the ~ of her opponent.)*. (٥) باشترین و جوانترین بەرگ: *( She was dressed in her ~ .)*.

*v.t.* بردنەوە؛ بەزاندن؛ زاڵبوون بەسەردا.

all for the best, لەئەنجامدا وا باشترە ئەگەرچی وایش دیار نییە.

as best one can, بەپێی توانا؛ بەگوێرەی توانا؛ هەتا بتوانرێت.

at best, (١) پەڕی ئەوپەڕی. (٢) لە باشترین باردا.

at one's best, لە باشترین شێوەدا بوون (تەندرووستی، کەیف، بار): *( The trees are at their best now. ; He was at his best that evening and amused us all with his jokes.)*

get (or have) the best of, بەزاندن؛ بۆپێبڕین؛ بەسەردا زاڵبوون.

had best, وا باشە؛ وا چاکە؛ وا باشترە؛ پێویستە: *( You had best go at once.)*

make the best of, گونجاندن بە باشترین شێوە؛ ئەوەی بتوانرێت دەیکات.

to the best of one's ability, بەوپەڕی تواناوە: *( I will serve my country to the best of my ability.)*

to the best of one's knowledge, بەپێی ئەوەی کە دەیزانێت.

**bestial** (bes′chəl, bes′tyəl), *adj.* (١) چوارپێیانە؛ تایبەتی بە گیاندار؛ نزم. (٢) دڕندانە؛ وەك دڕندە؛ پیس.

**bestiality** (bes′chi-al′ə-ti, bes′ti-al′ə-ti), *adj.* (١) ڕەوشتی گیاندارانە یا دڕندانە؛ چوارپێیەتی. (٢) کارێکی نزم و گیاندارانە (بەتایبەتی جووت بوون)؛ کارێکی بێ مێشکانە و نامرۆڤانە؛ جووت بوونی مرۆڤ و گیاندار

**bestiary** (bes′ti-er′i), *n.* کۆمەڵە چیرۆکێکە بە زمانی گیانداران دەربارەی مرۆڤ.

**bestir** (bi-stûr′), *v.t.* هێنانە جۆش؛ جم وجووڵ تێخستن؛ بزواندن؛ خۆ خەریك کردن.

**best man,** برازاوا.

**bestow** (bi-stō′), *v.t.* (١) ( ~ on ; ~ upon )؛ پێدان؛ پێ بەخشین: *( He ~s millions of dollars on this charity. ; to ~ a name, or an honor, on someone ; the gifts ~ed upon us by nature)* (٢) دان بە شوو. (٣) تەرخان کردن؛ کات پێوە بردنەسەر: *( He ~ed much time on the project.)* (٤) [Archaic]، دانان لە شوێنێکدا؛ عەمارکردن.

-bestowable *(adj.)*; bestowment *(n.)*.

**bestowal** (bi-stō′əl), *n.* (١) پێدان (بەخشیش). (٢) بەخشیش؛ دراو. (٣) دانان لەسەر.

**bestraddle** (bi-strad′′l), *v.t.* = straddle.

**bestrew** (bi-strōō′), *v.t.* (١) پەرش و بلاوکردنەوە؛ تۆودان. (٢) بەسەردا پەرش و بلاوبوونەوە: *( Papers ~ed the streets.)*.

**bestride** (bi-strīd′), *v.t.* (١) سواربوون (بەشێوەی سواربوونی ئەسپ). (٢) قاچ بەسەردا هەڵهێنانەوە.

**bestrow** (bi-strō′), *v.t.* = bestrew.

**best-seller** (best′sel′ẽr), *n.* پەرتووکێك یا ئەوانێك کە لە هەموو ئەوانی تر زیاتری لێ بفرۆشرێت لە ماوەیەکی تایبەتیدا.

**bet** (bet), *n.* (١) گرەو: *( to make a ~ )*. (٢) مەرجی گرەو.

(۳) شتێکی گرەو لەسەر کراو: *( This team is a good ~ .)* .

*v.t.* (۱) گرەوکردن: *( I ~ he will be late.)* .

(۲) گرەو لەسەر کردن.

***v.i.* ( ~ against ; ~ on ; ~ with ),** گرەوکردن؛ گرەو لەسەر کردن؛ گرەو لەگەڵ کردن.

**bet a person on,** گرەوکردن لەگەڵ کەسێك لەسەر.

**you bet!; you bet you!,** [Colloq.], بێ گومان بە؛ شایانی نی‌یە؛ هیچ نی‌یە. (ئەم وتەیە لە وەڵامی **" Thank you! "** دا دەوترێت).

**beta** (bā'tə, bē'tə), *n.* (۱) تیپی دووەمی ئەلفوبێی یۆنانی‌یە.
(۲) دووەم لە لیستەیەکدا؛ دووەم شت.

**betake** (bi-tāk'), *v.t.* (۱) چوون؛ ڕۆیشتن.
(۲) خەریك بوون؛ خۆ تەرخان کردن.

**beta rays,** تیشکی " بێتا "

**beta test,** تاقیکردنەوەی نەخوێندەوارێك.

**betatron** (bā'tə-tron'), *n.* ئامێری زیادکردنی خێرایی ئەلەکترۆن.

**betel** (bē't'l), *n.* (۱) ڕووەکێکی خۆهەڵواسەرە گەڵاکەی دەجووێنت بۆ سەرخۆشی (۲) گەڵای ئەم ڕووەکە.

**bethel** (beth'əl), *n.* (۱) شوێنێکی پیرۆز. (۲) پەرستگا.
(۳) کڵێسەی کەشتی‌یەوان.

**bethink** (bi-thiŋk'), *v.t.* (۱) بیرلێکردنەوە؛ تێڕوانین.
(۲) بیرکەوتنەوە؛ بیری خۆ خستنەوە.

***v.i.* [Archaic],** بیرکردنەوە.

**betide** (bi-tīd'), *v.i.* ڕوودان.

***v.t.*** لێ ڕوودان؛ بەسەرداهاتن؛ لێ قەومان.

**betimes** (bi-tīmz'), *adv.* (۱) زوو؛ بەر لە کاتی خۆی.
(۲) خێرا؛ بەپەلە؛ یەکسەر؛ بەبێ دواکەوتن.
(۳) پێش ئەوەی کات بەسەرچێت؛ پێش ئەوەی درەنگ بێت.

**betoken** (bi-tō'kən), *v.t.* نیشانەی ئەوەبوون؛ ئەوە دەرخستن.

**betray** (bi-trā'), *v.t.* (۱) ناپاکی کردن؛ خیانەت کردن:
*( to ~ one's country)*
(۲) شکاندن (بەڵێن)؛ ناپاکی کردن: *( He ~ed my trust in him.)* .
(۳) هەڵخەڵەتاندن؛ فریودان؛ دەستبڕین.
(٤) تاوکردن و لەگەڵ جووت بوون و مارە نەکردن.
(٥) دەرخستن: *( His face ~s his fear.)* .
(٦) پیشاندان؛ نیشانەی ئەوەبوون: *( The house ~s its age.)* .
(۷) درکاندن؛ بەدەستەوەدان (نهێنی)؛ هەڵماڵین.

**-betrayer** *(n.).*

**betrayal** (bi-trā'əl), *n.* ناپاکی؛ خیانەت.

**betroth** (bi-trôth', bi-trō*th*'), *v.t.* (۱) دان بە شوو؛ دیاریکردن؛ مارەکردن: *( Her father has ~ed her to his friend.)* .
(۲) [Archaic]. بەڵێنی شووکردن یا ژنهێنان پێدان.

**betrothal** (bi-trôth'əl, bi-trō'*th*əl), *n.* دان بە شوو؛ دیاریکردن؛ نیشانەکردن؛ شەکراو خواردنەوە؛ دەزگیرانێتی.

**betrothed** (bi-trôtht', bi-trō*th*d'), *adj.* دەزگیراندار؛ دیاریکراو؛ مارەبڕاو.

***n.*** کەسێکی دەزگیراندار؛ کەسێکی مارەبڕاو یا نیشانەکراو.

**better** (bet'ēr), *adj.* (۱) باشتر؛ چاکتر:
*( It's ~ to win than to lose.)*
(۲) زۆربەی؛ بەشی زۆری:
*( the ~ part of a day, an hour, his salary, etc.)*
(۳) باشتر (تەندروستی)؛ چاکتر:
*( He has been ill, but now he is ~ .)*

***adv.*** (۱) باشتر لە؛ چاکتر.
(۲) زیاتر *( ~ than a mile, pound, etc.)* .

***n.*** (۱) گەورەتر (مرۆڤ)؛ کەسێکی گەورەتر یا پلەوپایە بەرزتر:
*( Obey your ~s. ; I took you for your ~ .)*
(۲) شتێك یا بارێکی باشتر.
(۳) زاڵی؛ بۆڕپێدان؛ بردنەوە: *( I got the ~ of my rival.)* .

***v.t.*** (۱) بەزاندن؛ بەسەردا زاڵبوون. (۲) باشترکردن؛ پەرەپێدان.

***v.i.*** باشتربوون؛ چاکتربوون.

**better off,** (۱) دەوڵەمەندتر:
*( He is much better off than I .)*
(۲) باشتر لە (بار):
*( You are better off alone than being in bad company.)*

**for better or for worse,** لە هەموو بارودۆخ و کاتێکدا؛ لە باری باشیش و خراپیشدا.

**for the better,** بەرەو باشتر چوون (بارودۆخ).

**get (or have) the better of,** بەزاندن؛ بەسەردا زاڵبوون؛ بۆڕپێدان:
*( to get the better of someone)*

**had better,** وا باشترە؛ وا چاکە؛ پێویستە.

**think better of,** (۱) سەرلەنوێ بیرلێکردنەوە و بڕیار لەسەر دان؛ بڕیار گۆڕین. (۲) بە باشتر دانان.

**better** (bet'ēr), *n.* = **bettor.**

**better half,** [Colloq.], (۱) خێزان؛ ژن. (۲) مێرد.

**betterment** (bet'ēr-mənt), *n.* (۱) چاکردن؛ باشترکردن؛ چاکی؛ چاك بوون؛ باشی؛ سوود: *( the ~ of society)* .
(۲) چاکردنەوەی خانوو و زەوی‌وزار.

**betting** (bet'iŋ), *n.* گرەو؛ گرەوکردن.

**bettor** (bet'ēr), *n.* گرەوکەر.

**between** (bi-twēn'), *prep. & adv.* (۱) لەنێوان؛ لە ناوەڕاست؛ لە ناوەند: *( a bond ~ friends ; ~ two places)* .
(۲) بە هەردووکیان: *( B~ them they killed five birds.)* .
(۳) سەرمایەی هەردووکیان: *( The men had fifty dollars ~ them.)* .
(٤) لەنێوان: *( Choose ~ love and duty.)* .
(٥) بەهۆی هەردووکیانەوە.

**between ourselves,** بەینی خۆمان بێت.

**between you and me, = between ourselves.**

**far between,** زۆری بەین دەکەوێت؛ زۆر کەم؛ ناوبەناو.

**in between,** (۱) لەنێوان. (۲) لە ناوەڕاست؛ لە ناوچەق؛ لە ناو.

**betwixt** (bi-twikst'), *prep. & adv.* = **between.**

**betwixt and between,** نە لێرەو نە لەوێ؛ بە لایەکدا نەکەوتووە.

**bevel** (bev''l), *n.* (۱) گۆشەپێو (ئامێر، ڕاستە).
(۲) گۆشەی خوار. (۳) ڕوویەکی خوار یا لێژ.

***v.t.*** گۆشەی خوار بڕین.

***v.i.*** لێژبوون؛ خواربوون.

***adj.*** لێژ؛ خوار.

**bevel gear,** ئامێری بڕین و ڕێك‌وپێك کردنی گۆشەی خوار (دارتاشی).

**beverage** (bev'rij, bev'ēr-ij), *n.* خواردنەوە (جگە لە ئاو).

**bevy** (bev'i), *n.* (۱) دەستە (کچ، ژن)؛ کۆمەڵ. (۲) پۆل (قەتن).

**bewail** (bi-wāl'), *v.t. & v.i.* شین بۆ کردن؛ بۆ گریان؛ داخ بۆ خواردن؛ سکاڵاکردن.

**beware** (bi-wâr'), *v.i. & v.t.* وریابوون؛ وریا بە!؛ ئاگادار بە!:
*( B~ of the dog! ; B~ of pickpockets! ; You should ~ of bad companions.)*

**bewilder** (bi-wil'dēr), *v.t.* سەرسووڕماندن؛ واق وڕماندن؛ سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێواندن؛ حەپەساندن.

**bewildered** (bi-wil'dērd), *adj.* سەرسووڕماو؛ واق وڕماو؛ سەر لێ تێکچوو؛ سەر لێ شێواو؛ حەپەساو.

**bewildering** (bi-wil'dēr'iŋ), *adj.* سەرسووڕمێنەر؛ واق وڕمێنەر؛ سەر لێ تێکدەر؛ سەر لێ شێوێنەر؛ حەپەسێنەر.

**bewilderment** (bi-wil′dẽr-mənt), *n.* سەرسووڕمان؛
واق ووڕمان؛ سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێوان؛ حەپەسان؛ حەپەساوی.
**bewitch** (bi-wich′), *v.t.* (۱) جادوبەندلێکردن؛ نوشتەلێکردن؛
جادوبەنی کردن (۲) دڵفڕاندن؛ شێت‌وشەیداکردن.
**-bewitchment** *(n.).*
**bey** (bā), *n.* (۱) بەگ. (۲) فەرمانڕەوای ناوچەیەکی بچووکی تورکیا.
(۳) نازناوی فەرمانڕەوا کۆنەکانی تونس.
**beyond** (bi-yond′), *prep.* (۱) لەولای؛ لەولا؛ لەودیو؛ لەوپەڕ
(۲) دوا (کات)؛ لەدوا؛ لەپاش
(۳) (ق) بەدەر: *( ~ help ; ~ belief)* .
(٤) زیاد لە؛ زیاتر لە؛ لەوە بەولاوە:
*( He says nothing ~ what we already know.)*
***adv.*** دوور؛ دوورتر؛ ئەوپەڕ؛ ئەولا
**beyond compare,** بێ هاوتا؛ بێ وێنە؛ نایاب.
**beyond one's reach,** لەبەردەستدا نییە؛ دەست نایگاتێ؛
بە دەست ناکەوێت (ئاوات، ئامانج)
**the beyond,** (۱) شتێکی دوور (۲) ئەوەودنیا؛ قیامەت.
**the great beyond,** ئەوەودنیا؛ قیامەت.
**to live beyond one's means,** پێ لە بەڕەی خۆ زیاتر ڕاکێشان؛
لە دەسکەوتی خۆ زیاتر خەرج کردن.
**bezant, bezzant** (bez′'nt, bə-zant′), *n.* (۱) پارەیەکی زێڕی
بیزەنتی کۆنە. (۲) کەرەسەی ڕازاندنەوەی خانوو کە لەشێوەی ئەم پارەیەدایە.
**bezel, bezil** (bez′'l), *n.* (۱) ڕوویەکی لێژ (وەك دەمی ئەسکەنە).
(۲) ڕاگری شووشەی کاتژمێر لە جێی خۆیدا.
**bhang** (baŋ), *n.* بەنگ.
**bi-** (bī), پێشگرێکە بەمانای: (۱) دووانە: دوو: *(biangular)* .
(۲) لە دوو لاوە؛ دووانی *(bilingual)*
(۳) هەر دوو هەفتە، مانگ، ساڵ... هتد جارێك؛ هەر هەفتە یا مانگی دووجار:
*(biweekly; bimonthly)*
(٤) دوولایی *(bilateral)* .
(٥) بە جووت؛ جووتە.
**biangular** (bi-aŋ′gyə-lẽr), *adj.* دووگۆشەیی
**biannual** (bī-an′yōō-əl), *adj.* ساڵی دوو جار؛ نیوساڵی:
*( a ~ publication)*
**-biannually** *(adv.).*
**bias** (bī′əs), *n.* (۱) لایەنگری؛ لایەنگیری؛ لایەن گرتن.
(۲) هێڵێکی خواری دووراو بە جل‌وبەرگەوە.
***adj.*** لار؛ خوار؛ چەپ‌و ڕاست.
***adv.*** بە لاری؛ بە خواری.
***v.t.*** کارتێکردن بۆ لایەنگری کردنی شتێك یا دژ وەستانی.
**biased** (bī′əst), *adj.* لایەنگر؛ لایەندار
*( A ~ person can't be a fair judge.)*
**biauricular** (bī′ô-rik′yə-lẽr), *adj.* (۱) biauriculate .
(۲) تایبەتی بە هەردوو گوێچکەی دەرەوە
**biauriculate** (bī′ô-rik′yə-lit), *adj.* (۱) دوو گوێچکۆلەدار (دڵ)
(۲) دوو گوێچکۆلەدار (گەڵا).
**bib** (bib), *v.t. & v.i.* خواردنەوە
***n.*** (۱) بەروانکەی منداڵ. (۲) لاسەرووی بەروانکە.
**bib and tucker,** [Colloq.], جل‌وبەرگ
**bibb** (bib), *n.* (۱) بەلووعەی دەم نووشتاوە.
(۲) گۆشەی تەوەرەی کەشتی ڕاگر.
**bibber** (bib′ẽr), *n.* سەرخۆش؛ مەی خۆر؛ عەرەق خۆر.
**bibcock** (bib′kok′), *n.* بەلووعەیەکی دەم نووشتاوە.
**Bible** (bī′b'l), *n.* ئینجیل.
**Bible Belt,** ئەو ناوچانەی لای خواروی ئەمەریکا کە خاچ پەرستی
تێدا بەهێزە.
**Biblical, biblical** (bib′li-k'l), *adj.* تایبەتی بە ئینجیل؛
ئینجیلی.
**Biblicist** (bib′li-sist), *n.* (۱) کەسێك کە بە کوێرانە بڕوای بە ئینجیل
بێت یا لێکی بداتەوە. (۲) زانای ئینجیل.
**biblio-** (bib′li-ō, bib′li-ə), پێشگرێکە بەمانای: (۱) پەڕتووك؛
تایبەتی بە پەڕتووك. (۲) ئینجیلی؛ تایبەتی بە ئینجیل.
**bibliographer** (bib′li-og′rə-fẽr), *n.* زانای بیبلۆگرافیا؛
سەرچاوەی پەڕتووك زان.
**bibliography** (bib′li-og′rə-fi), *n.* (۱) لیستەی سەرچاوەکان؛
سەرچاوەکانی پەڕتووکێك. (۲) سەرچاوەناسی؛ زانستی بیبلۆگرافیا.
**-bibliographic; bibliographical** *(adj.).*
**bibliolatry** (bib′li-ol′ə-tri), *n.* (۱) بە کوێرانە ئینجیل لێکدانەوە.
(۲) خولیای پەڕتووك بوون؛ زۆر حەزکردن لە پەڕتووك.
**-bibliolater** *(n.).*
**bibliomancy** (bib′li-ə-man′si), *n.* دواڕۆژ بینین لەڕێی-
ئینجیلەوە.
**bibliomania** (bib′li-ə-mā′ni-ə), *n.* شێتی پەڕتووك کڕین‌و
کۆکردنەوە بوون (بەتایبەتی هی کۆن‌و دانسقە)؛ خولیای پەڕتووك کڕین بوون.
**-bibliomaniac** *(adj.).*
**bibliopegy** (bib′li-op′ə-ji), *n.* هونەری بەرگ تێگرتنی پەڕتووك.
**bibliophile** (bib′li-ə-fīl′), *n. Also* **bibliophil,** (۱) حەزکەر لە
پەڕتووك؛ پەڕتووك خۆشەویست. (۲) پەڕتووك کۆکەرەوە.
**bibliopole** (bib′li-ə-pōl′), *n.* فرۆشیاری پەڕتووکی کۆن‌و دانسقە.
**-bibliopolist** *(n.)*; **bibliopoly** *(n.).*
**bibliotheca** (bib′li-ə-thē′kə), *n.* (۱) پەڕتووکخانە.
(۲) کەتەلۆگ یا لیستەی پەڕتووك. (۳) [Obs.]، ئینجیل.
**bibulous** (bib′yoo-ləs), *adj.* (۱) هەلمژ؛ زۆر هەلمژ.
(۲) هەمیشە مەی خۆرەوە؛ عەرەق خۆر. (۳) سەرخۆش.
**bicameral** (bī-kam′ẽr-əl), *adj.* دوو ئەنجوومەنی (پەرلەمان).
**bicarbonate** (bī-kär′bə-nit, bī-kär′bə-nāt′), *n.* بیکاربۆنات.
**bice** (bīs), *n.* (۱) شین. (۲) بۆیەی شین. (۳) سەوز یا بۆیەی سەوز.
**bicentenary** (bī-sen′tə-ner′i, bī′sen-ten′ẽr-i), *n. & adj.*
= **bicentennial.**
**bicentennial** (bī′sen-ten′i-əl), *adj.* (۱) دووسەد ساڵەیی؛
دووسەد ساڵە: *( the ~ celebration of independence)* .
(۲) دووسەد ساڵ خایەن.
(۳) تایبەتی بە یادی دووسەد ساڵە.
***n.*** یادی دووسەد ساڵە؛ یادی دووسەد ساڵانە.
**bicephalous** (bī-sef′ə-ləs), *adj.* دووسەرە (گیاندار).
**biceps** (bī′seps), *n.pl.* ماسولکەی قۆڵ‌و ڕان.
**bicipital** (bī-sip′ə-t'l), *adj.* (۱) دووسەری (ماسولکە).
(۲) ماسولکەیی.
**bicker** (bik′ẽr), *v.i.* (۱) شەڕەقسەکردن؛ شەڕە دەنووك کردن؛
مشت‌وڕ کردن لەسەر شتی هیچ‌وپووچ. (۲) خوڕەخوڕهاتن (جۆگەلە).
(۳) پرتەپرت کردن (چرا، مۆم)؛ ترووسکانەوە.
***n.*** دەمەقاڵێ؛ شەڕەقسە؛ شەڕە دەنووك.
**bicolor** (bī′kul′ẽr), *adj.* دووڕەنگی؛ دووڕەنگ.
**bicolored** (bī′kul′ẽrd), *adj.* = **bicolor.**
**biconcave** (bī-kon′kāv, bī′kon-kāv′), *adj.* هەردوو ڕوو قوپاو.
**biconvex** (bī-kon′veks, bī′kon-veks′), *adj.* هەردوو ڕوو
قۆقز.
**bicorn** (bī-kôrn), *adj.* (۱) دووشاخە (گیاندار)؛ دووشاخی.
(۲) کەوانەیی.

**bicornuate** (bī-kôr′nū-it), *adj.* = **bicorn.**

**bicorporal** (bī-kôr′pēr-əl), *adj. Also* **bicorporeal,** دوولەشە؛ دوولەشی؛ دووتەندار.

**bicuspid** (bī-kus′pid), *adj. Also* **bicuspidate,** دوو سەری تیژی هەیە؛ دوو نووکدار (ددان).

*n.* ددانی پێش کاکیلە.

**bicycle** (bī′si-k'l), *n.* ئەسپە ئاسنینە؛ پاسکیل.

*v.i. & v.t.* سواری ئەسپە ئاسنینە بوون؛ سواری پاسکیل بوون؛ پاسکیل لێخوڕین.

**bicyclic** (bī-sī′klik, bī-sik′lik), *adj.* (١) دوو سووڕی؛ دوو خولی. (٢) دوو ئەلقەیی (گوڵ)؛ دوو بازنەیی. (٣) دوو چەرخی؛ وەك پاسکیل.

**bicyclist** (bī-si′klist), *n.* پاسکیل سوار.

**bid** (bid), *v.t.* (١) فەرمان کردن؛ پێ وتن. (٢) مەزاد کردن. (٣) بە ئاشکرا وتن. (٤) [Archaic]، بانگ کردن (ئاهەنگ، کۆڕ). (٥) [Colloq.]، ئەندامێتی پێدان.

*v.i.* مەزات کردن.

*n.* (١) مەزاد (٢) ئەو نرخەی پێشنیازکراوە. (٣) هەوڵ. (٤) [Colloq.]، بانگ کردن (بۆ بوون بە ئەندام).

**bid against,** پارە لەسەر زیادکردن (مەزاد).

**bid fair,** لەوە دەچێت یا وا دیارە (سەرگرتنی کارێك یا ڕوودانێك).

**bid (a person) farwell,** خواحافیزی لێکردن.

**bid (a person) good-bye,** خواحافیزی لێکردن.

**bid (a person) good-night,** شەوباش لێکردن.

**bid up,** پارە لەسەر زیادکردن (مەزاد).

**bid welcome,** بەخێرهاتن لێکردن.

**make a bid for,** هەوڵ بۆ دان؛ هەوڵی دەسکەوتن دان:

***( He made a bid for the presidency.)***

**biddable** (bid′ə-b'l), *adj.* (١) دەستەمۆ؛ مالی؛ گوێ ڕایەڵ. (٢) دەهێنێت پارەی لەسەر زیاد بکرێت (قومار).

**bidden** (bid′'n), *alternative p.p. of* **bid.**

***adj.*** بانگ کراو (ئاهەنگ، کۆڕ).

**bidden** (bid′'n), *obsolete p.p. of* **bide.**

**bidder** (bid′ẽr), *n.* مەزادکەر؛ پارە لەسەر زیادکەر (مەزاد، قومار).

**bidding** (bid′iŋ), *n.* (١) فەرمان؛ فەرمایشت؛ داوا. (٢) بانگ کردن؛ داوای ئامادەبوون کردن. (٣) مەزاد؛ پارە لەسەر زیادکردن (مەزاد، قومار).

**at the bidding of,** لەژێردەستدایە؛ لەبەردەستدایە؛ ملکەچێتی؛ لە خزمەتی ئەودایە.

**do the bidding of,** فەرمانی کەسێك بەجێهێنان؛ گوێ لێگرتن؛ لە قسە دەرنەچوون.

**biddy** (bid′i), *n.* مریشك؛ مامر

**biddy** (bid′i), *n.* [Slang], پیرێژنێکی زۆربوێژ.

**bide** (bīd), *v.i.* [Archaic or Dial.], (١) مانەوە بەشێوەی خۆ؛ نەگۆڕان؛ بەردەوام بوون. (٢) چاوەڕێ کردن. (٣) نیشتەجێبوون؛ مانەوە لەشوێنێکدا.

*v.t.* دەربڕدن؛ بەرگەگرتن؛ مانەوە.

**bid one's time,** چاوەڕێی هەل کردن.

**bidentate** (bī-den′tāt), *adj.* دووداندار؛ دوو ددان یا ئەندامی وەك ددانی هەیە.

**bidet** (bi-dā′), *n.* دەستشۆرێکی نزمە بۆ گەڵوگوێن و پاشەڵ شتن.

**biennial** (bī-en′i-əl), *adj.* (١) هەر دوو ساڵ جارێك ڕوودەدات؛ دوو ساڵانە؛ دوو ساڵی. (٢) دوو ساڵ دەژی (ڕووەك).

*n.* (١) ڕووداوێك کە هەر دوو ساڵ جارێك ڕوودەدات؛ ڕووداوێکی دوو ساڵانە. (٢) ڕووەکێك کە دوو ساڵ دژەی (بەر یا گوڵ دەگرێت لە ساڵی دووەمدا).

**-biennially** *(adv.).*

**biennium** (bī-en′i-əm), *n.* ماوەی دوو ساڵ.

**bier** (bêr), *n.* تەرم؛ دار تەرم؛ تابووت.

**biestings** (bēs′tiŋz), *n.pl.* = **beestings.**

**bifacial** (bī-fā′shəl), *adj.* دوو ڕوو (شت، ڕووەکناسی).

**bifarious** (bī-fâr′i-əs), *adj.* دوو ڕیزە (گەڵا).

**biff** (bif), *n.* [Slang], زللە؛ مستەکۆڵە.

*v.t.* [Slang], زللە لێدان؛ مستەکۆڵە پیاکێشان.

**biffin** (bif′in), *n.* جۆرێکە لە سێوی سوور.

**bifid** (bī′fid), *adj.* دووفاق؛ دووفلیقانە.

**biflex** (bī′fleks), *adj.* دووپێچی؛ لە دوو شوێندا نوشتاوەتەوە.

**bifocal** (bī-fō′k'l), *adj.* بۆ دوو ماوەی دووری کراوە (چاویلکە).

*n.* گەردبینی چاویلکەیەك کە بەشێکی بۆ بینینی شتە لەنزیکەوە وەك خوێندنەوە، وە بەشەکەی تریشی بۆ بینینی شتە لەدوورەوە.

**bifocals** (bī-fō′k'lz, bī′fō′k'lz), *n.pl.* چاویلکەیەکە بەشێکی گەردبینەکەی بۆ بینینی شتە لەنزیکەوە وەك خوێندنەوە، وە بەشەکەی تریشی بۆ بینینی شتە لەدوورەوە.

**bifoliate** (bī-fō′li-it), *adj.* دووگەڵایی؛ دوو گەڵای هەیە.

**biforked** (bī-fôrkt′), *adj.* = **bifurcate.**

**biform** (bī′fôrm′), *adj.* دووشێوەیی؛ دوو شێوەی هەیە.

**bifurcate** (bī′fẽr-kāt′, bī-fũr′kit), *adj.* دوولقی؛ دووبەشی؛ دووفاقەیی؛ دووپەلی.

*v.t.* دووپەل کردن؛ کردن بە دوو بەشەوە؛ دووفاقەکردن؛ جیاکردنەوە.

*v.i.* دووپەل بوون؛ دووفاقەبوون؛ جیابوونەوە.

**-bifurcation** *(n.).*

**big** (big), *adj.* (١) گەورە؛ زل؛ قەبە؛ زۆر (ژمارە). (٢) درشت؛ هەراش. (٣) سکپڕ؛ ئاووس: ***( ~ with child)*** . (٤) بەرز (دەنگ)؛ گەورە (دەنگ). (٥) [Obs.]، بەهێز؛ توند. (٦) گرنگ؛ گەورە (کار)؛ شایانی باس: ***( He does ~ things.)*** . (٧) فشە؛ زل (قسە): ***( ~ talk)*** . (٨) باش (دڵو دەروون)؛ بەخشندە؛ لەخۆبوردوو: ***( He has a ~ heart.)*** . (٩) زۆر؛ ئێجگار؛ گەورە: ***( There's a ~ difference between them.)*** .

*adv.* [Colloq.], بە لاف‌وگەزافەوە؛ بەفشەوە: ***( He talks ~ .)*** .

**bigamist** (big′ə-mist), *n.* پیاوێکی دوو ژنە؛ ژنێکی دوو مێرددار.

**bigamous** (big′ə-məs), *adj.* دوو ژنە؛ دوو مێرددار.

**bigamy** (big′ə-mi), *n.* دوو ژنی؛ دوو مێردداری.

**bigaroon** (big′ə-rōōn′), *n.* = **bigareau.**

**bigareau** (big′ə-rō′), *n.* گێلاس.

**Big Ben,** (١) زەنگی کاتژمێرە گەورەکەی سەر بورجی پەرلەمانی ئینگلیزی لە لەندەن. (٢) کاتژمێرەکە خۆی.

**Big Dipper,** ناوی حەوتەوانەیەکە.

**big game,** (١) گیانداری گەورەی ڕاوکراو (شێر، پڵنگ... هتد). (٢) [Colloq.]، ئامانجی کارێکی گرنگ‌و پڕ مەترسی.

**biggish** (big′ish), *adj.* نەختێك زل یا گەورە.

**bighead** (big′hed′), *n.* [Colloq.], لەخۆبایی بوون؛ لووت بەرزی.

**-bigheaded** *(adj.).*

**bighearted** (big′här′tid), *adj.* بەخشندە؛ دڵ فراوان.

**bighorn** (big′hôrn′), *n.* مەڕەکێوییەکی شاخ درێژو چەمارەیە.

**bight** (bīt), *n.* (١) پێچ؛ قوژبن. (٢) قوڵفە (پەت، گوریس). (٣) پێچاوپێچی (ڕوبار)؛ پێچ. (٤) کەنداو.

**bignonia** (big-nō′ni-ə), *n.* بەگنۆنیا: ڕووەکێکی هەمیشە سەوزی خۆهەڵواسەری گوڵ ڕەنگینە.

**bigot** (big′ət), *n.* کەسێکی ڕەگەزپەرست؛ کەسێکی مێشك تەسك‌و کوێرباوەڕ.

**bigoted** (big′ət-id), *adj.* ڕەگەزپەرست؛ مێشك تەسك؛ کوێرباوەڕ.

**bigotry** (big'ət-ri), *n.* ڕەگەزپەرستی؛ مێشك تەسكی.
**big shot,** [Slang], كەسێكی بەدەسەڵات؛ كەسێكی گرنگ.
**big time,** [Slang], (١) بەرزترین پلەی پیشەیەك.
(٢) كاتێكی خۆش.
**-big-time** *(adj.)*; **big-timer** *(n.)*.
**big top,** [Colloq.], (١) سەری دەواری سیرك.
(٢) سیرك.
**big tree,** درەختی "سكۆیا" ی ئەمەریكی: درەختێكی زۆر بەرزو قەد ئەستوورو ڕاستە.
**big wheel,** [Slang], = **big shot.**
**bigwig** (big'wig'), *n.* [Slang], = **big shot.**
**bihourly** (bī-our'li), *adj. & adv.* هەر دوو سەعات جارێك.
**bijou** (bē'zhōō, bi-zhōō'), *n.* (١) گەوهەر؛ بەردێكی بەنرخ.
(٢) شتێكی بچووكی جوانی بەنرخ.
**bijouterie** (bē-zhōō'tēr-i), *n.* (١) خشل؛ بەردی بەنرخ.
(٢) مت‌ومووروو؛ ووردەشتی بریقەدار.
**bijugate** (bī'joo-gāt', bī-jōō'git), *adj.* دوو جووت گەڵای بچووكی هەیە
**bike** (bīk), *n., v.t. & v.i.* [Colloq.], = **bicycle.**
**bikini** (bi-kē'nē), *n.* جلی دوو پارچەیی مەلەی ژنان (كە زۆر كەم لەش دادەپۆشێت).
**bilabial** (bī-lā'bi-əl), *adj.* (١) **bilabiate**.
(٢) لە گرتنی تەووژمی هەواو بەرەڵاكردنی پەیدا دەبێت.
(وەك لە وتنی تیپی: **b, m, p** دا) (دەنگزانی).
*n.* دەنگێكی بەم جۆرە پەیدابوو
**bilabiate** (bī-lā'bi-āt', bī-lā'bi-it), *adj.* دوو لێواردار (گوڵ).
**bilateral** (bī-lat'ēr-əl), *adj.* (١) دوولایی؛ دوو لای هەیە
(٢) لە هەردوو لاوە
(٣) دووقۆڵی؛ تایبەتی بە هەردوو لا: *(a ~ traty; ~ relations)*.
(٤) ڕێك لە هەردوو لاوە.
**bilbo** (bil'bō), *n.* (١) *(pl.)* پێوەند؛ پێوەندی دیل یا بەند.
(٢) [Archaic]. شمشێر؛ ڕم.
**bile** (bīl), *n.* (١) زەرداو؛ زراو. (٢) ڕق؛ قین؛ تووڕەیی.
**bilestone** (bīl'stōn'), *n.* بەردی زراو
**bilge** (bilj), *n.* (١) قۆقزی بەرمیل؛ بۆشایی پیپ.
(٢) بنە خڕو بۆشەكەی كەشتی. (٣) ئەو ئاوە پیسەی تێیدا كۆدەبێتەوە.
(٤) [Slang]. شتێكی هیچ‌وپووچ و بێ مانا.
*v.t. & v.i.* (١) شكاندن یا درزتێبوون (بنی كەشتی).
(٢) ئاوسان؛ هەوكردن؛ دەرپۆقین.
**bilge water,** ئاوی بۆگەن كە لەبنی كەشتیدا كۆدەبێتەوە.
**bilgy** (bil'ji), *adj.* بۆگەن (وەك ئاوی وەستاوی بۆگەن)
**bilharzia** (bil-här'zi-ə), *n. Also* **bilharziasis,** بەلهارزیا.
**biliary** (bil'i-er'i, bil'yēr-i), *adj.* هی زەرداو؛ تایبەتی بە زراو.
**bilingual** (bī-liŋ'gwəl), *adj.* (١) بە دوو زمان دەربڕاو یا نووسراو؛ دوو زمانی (٢) دوو زمان زان. *( a ~ person)*.
*n.* كەسێكی دوو زمان زان.
**bilingualism** (bī-liŋ'gwəl-iz'm), *n.* دوو زمان زانی؛ دوو زمان زانین
**bilious** (bil'yəs), *adj.* (١) تایبەتی بە زەرداو یا زراو.
(٢) نەخۆشی زراوی هەیە. (٣) تووڕەوتڕۆ.
**biliteral** (bī-lit'ēr-əl), *adj.* دووتیپی (ووشە)
*n.* ووشەیەكی دووتیپی؛ بەشێكی دووتیپی ووشە.
**-bility** (bil'ə-ti), پاشگرێكە بەمانای: -یتی: *(responsibility)*.
**bilk** (bilk), *v.t.* (١) خەڵەتاندن؛ ساختەلێكردن؛ دەستبڕین.
(٢) قەرزنەدانەوە.
*n.* (١) خەڵەتاندن؛ فێڵ؛ دەستبڕین.
(٢) ساختەچی؛ كەسێكی دەستبڕ یا فێڵباز.
**bill** (bil), *n.* (١) لیستەی شتومەكی كڕراوو نرخەكانیان؛ لیستەی حساب (شتومەكی كڕراو، كرێ، میوانخانە، چێشتخانە).
(٢) لیستە (خواردەمەنی چێشتخانە، فیلمی پیشاندراو).
(٣) پرۆگرامی سەر شانۆ.
(٤) بڵاونامە؛ پۆستەر یا تەبەقە كاغەزێكی گەورەو ئەستوور كە بڵاوكراوەی لەسەر چاپ دەكرێت‌و بڵاودەكرێتەوە.
(٥) گەڵاڵە (یاسا)؛ گەڵاڵەنامە. (٦) كۆمپیالە؛ بانكەنۆت. (٧) پارەی كاغەز.
(٨) [Obs.]، بڕوانامە. (٩) لیستەی تاوان (دادگا).
*v.t.* (١) لیستەكردن؛ كردن بە لیستە؛ ووردكردنەوەی شت لە لیستەیەكدا.
(٢) لیستەی تاوان پێدان.
(٣) بڵاوكردنەوە لەسەر پۆستەر یا تەبەقە كاغەزی ئەستوور.
(٤) هەڵواسینی ئەم بڵاوكراوانە لەناو شاردا. (٥) شتومەك ناردن.
(٦) ناردنی لیستەی شتومەكی كڕراوو نرخەكانیان بۆ كڕیار بۆ دانی پارەكەی.
**fill the bill,** [Colloq.], باشە؛ خراپ نییە؛ پەسەندە (بۆ مەبەستێك یا ئەركێكی تایبەتی).
**foot the bill,** [Colloq.], خەرجی دان؛ پارە دان؛ دانی كرێ یا پارەی تێچوو.
**bill** (bil), *n.* (١) دەنووك (باڵندە). (٢) نووكی قووڵاپی لەنگەر.
(٣) [Colloq.]، لێواری تەپلە یا كڵاو.
*v.i.* (١) دەنووك لێكخستن (نیشانەی خۆشەویستی).
(٢) دەست پیاهێنان (خۆشەویستی).
**bill and coo,** ماچ كردن‌و دەست پیاهێنان‌و بە گوێدا چرپاندن (دڵداری).
**bill** (bil), *n.* (١) شمشێرێكی دەم پان. (٢) داس.
(٣) چەكێكی كۆنی دەسك درێژە دەمێكی قووڵاپی نووك تیژی هەیە.
(٤) هەڵگری ئەم جۆرە چەكە.
**billboard** (bil'bôrd', bil'bōrd'), *n.* تەختەی ئاگاداری.
**billet** (bil'it), *n.* (١) فەرمانی جێگەكردنەوەی سەربازو ئەفسەر لە ماڵی خەڵكدا. (٢) شوێنی حەوانەوەو نووستنی سەربازو ئەفسەر لەدەرەوەی ئۆردووگا. (٣) كار؛ ئیش؛ فەرمانبەری.
(٤) [Archaic]، نامە یا بڕوانامەیەكی كورت.
*v.t.* (١) سەرباز دابەشكردن بەسەر ماڵی خەڵكدا بۆ حەوانەوە.
(٢) فەرمانی سەربازو ئەفسەر حەوانە بەسەردادان.
(٣) كار یا فەرمانبەری پێدان؛ دامەزراندن لەسەر كار.
**billet** (bil'it), *n.* (١) بڕەدار؛ دارێكی سووتاندن یا سووتەمەنی.
(٢) داردەست؛ دار حەیزەران. (٣) شیشە ئاسن.
(٤) دانەیەك لە چەند شیشێكی كورتی جوان كە لە خانووسازیدا بەكاردێت.
(٥) (ا) ئەو بەشەی پشتێن یا تەنگە كە لە ئاوزونەكە قایم دەكرێت
(ب) ئەو قوڵفەیەی پانتۆڵ كە سەرە زیادەكەی قایشی پیادەكرێت.
**billet-doux** (bil'i-dōō'), *n.* نامەی دڵداری.
**billfish** (bil'fish'), *n.* جۆرە ماسییەكی لووت درێژە.
**billfold** (bil'fōld'), *n.* جزدان.
**billhead** (bil'hed'), *n.* (١) پەڕەیەك كاغەزە ناوونیشانی كۆمپانیا یا دەزگایەك بە سەرەكەیەوەیەتی. (٢) ناوونیشانێكی وەها چاپكراو.
**billhook** (bil'hook'), *n.* داس.
**billiard** (bil'yērd), *adj.* تایبەتی بە یاری بلیارد.
*n.* لێدانێكی تۆپی بلیارد.
**billiards** (bil'yērdz), *n.* یاری بلیارد.
**billing** (bil'iŋ), *n.* (١) لیستەی ناوی ئەكتەرانی شانۆگەرییەك لەسەر پرۆگرامی شانۆگەرییەكە یا بڵاوكراوەكانی.
(٢) شێوەی ڕێكخستن یا ڕیزكردنی ئەم ناوانە.
**billingsgate** (bil'iŋz-gāt'), *n.* قسەی پیس؛ قسەی بازاڕی.
**billion** (bil'yən), *n.* (١) بلیۆن: هەزار ملیۆن (لە ئەمەریكاو فەرەنسا).
(٢) بلیۆن: ملیۆن ملیۆن (لە ئینگلتەرەو ئەڵمانیا).

**blistery** (blis'tēr-i), ***adj.*** بلۆقاوی؛ تلۆقاوی؛ ئاوساو و سووربووەوە.
**blithe** (blīth), ***adj.*** شاد؛ دڵشاد؛ دەم بە پێکەنین؛ دڵخۆش.
**-blithely *(adv.)*; blitheness *(n.)*.**
**blithering** (blith'ēr-iŋ), ***adj.*** قسەی هیچ و پووچ کەر؛ قسەی قۆڕ و بێ تام کەر.
**blithesome** (blīth'səm), ***adj.*** دەم بە پێکەنین؛ شاد؛ ڕووخۆش.
**-blithesomely *(adv.)*; blithesomeness *(n.)*.**
**blitz** (blits), ***n.*** [Colloq.], (١) بۆمبابارانێکی لەپڕ و توند و تیژ و وێرانکەری گشتی. (٢) هێرش یا پەلاماردانێکی سوپایی لەپڕ و توند و تیژ. (٣) هێرشێکی بەهێز و گشتی (پڕوپاگەندە): ***( to launch an advertising ~ )***
***v.t.*** (١) داگرتنەوە بە پڕوپاگەندە یا دەنگوباس. (٢) لەپڕ بۆمبابابارانکردن و وێرانکردن.
**blitzkrieg** (blits'krēg´), ***n.*** (١) هێرشێکی سوپایی لەپڕ و بەهێز و گشتییە لە ئاسمان و زەمینیشەوە. (٢) هێرشێکی لە ناکاو و گشتی و بەهێز (پڕوپاگەندە، بازرگانی، ڕۆشنبیری)؛ هەوڵێکی کۆمەکی و گشتی و بەدڵ.
**blizzard** (bliz'ērd), ***n.*** (١) گەردەلوولێکی بەفرینی سارد؛ کڕێوە؛ بەفروبایەکی زۆر سارد. (٢) ڕەشەبایەکی قایم؛ گەردەلوولێکی توند و بەهێز.
**bloat** (blōt), ***adj.*** ئاوساو؛ فووتێکراو؛ فش.
***v.t. & v.i.*** (١) فووتێکردن؛ ئاوساندن؛ ئاوسان. (٢) فووتێکردن (مرۆڤ)؛ خۆفشکردنەوە.
***n.*** (١) کەسێک یا شتێکی فووتێکراو، ئاوساو، فش، یا فش کراوە. (٢) [Slang]، کەسێکی سەرخۆش. (٣) سک ئاوسان (پزیشکەوانی گیانداران).
**bloat** (blōt), ***v.t.*** قاوورمەکردنی ماسی.
***n.*** ماسی قاوورمە.
**bloated** (blōt'id), ***adj.*** (١) ئاوساو؛ فووتێکراو؛ فش. (٢) فووتێکراو (مرۆڤ)؛ بەفیز؛ لووت بەرز. (٣) قەڵەو؛ وورگن.
**bloater** (blōt'ēr), ***n.*** ماسییەکی گەورەی قاوورمەکراو.
**blob** (blob), ***n.*** (١) دڵۆپ (مەرەکەب، بۆیە، شلە)؛ تۆپەڵ. (٢) پەڵەیەک ڕەنگ یا بۆیە بەسەر ڕوویەکەوە
***v.t.*** لێ هەڵپرژاندن و پەڵە درووستکردن (ڕەنگ، بۆیە).
**bloc** (blok), ***n.*** بەرە؛ یەکێتی (مرۆڤ، کۆمەڵە، وڵات).
**block** (blok), ***n.*** (١) پارچەیەکی پتەوی تەخت (دار، تەختە، بەرد، کانزا). (٢) بڕەدار؛ مووڕەدار؛ پارچە تەختە. (٣) سێپایەکی تەختە یا دارە شتی لەسەر لەت دەکرێت؛ تەختەی شت لەسەر جنین یا کار لەسەر کردن: ***( a butcher's ~ )*** . (٤) سێپاداریتەی خەڵك لەسەر سەربڕین: ***( a headman's ~ )*** . (٥) سەکۆی هەراجکەر؛ سنووقی دەلاڵ یا مەزاتکەر. (٦) دارِشتگە؛ قاڵب. (٧) دارێکی بە پێوەیە سەرەکەی وەك سەر وایە شەپقەی لەسەر پیشان دەدرێت لە فرۆشگادا. (٨) کۆسپ؛ قۆرت؛ بەربەست. (٩) خولخولۆکە. (١٠) پاڵپشت (دار، تەختە، ئاسن). (١١) خشتی گەورەی ناو بۆش (خانووسازی). (١٢) خشتەداری یاری منداڵان. (١٣) چەند خانوویەکی بە یەکێك دانراو. (١٤) خانووی نێوان چوار شەقام. (١٥) ڕیزێك خانووی نێوان دوو شەقام؛ ماوەی ئەم ڕیزە خانووە؛ بلۆك؛ جادە: ***( His office is only four ~s away.)*** (١٦) بەرە؛ یەکێتی؛ کۆمەڵ: ***( the Socialist ~ )*** . (١٧) [Slang]، سەری مرۆڤ. (١٨) خوێن لێ بڕین (پزیشکەوانی)؛ سڕکردن. (١٩) کلێشە (چاپەمەنی). (٢٠) دەم بەستران یا لەپڕ بیر بۆ نەکراوە (دەروونناسی): ***( to have an emotional ~ )*** (٢١) هێڵی شەمەندەفەری نێوان دوو چرا. (٢٢) بەرەوبڕی دانەوە (وەرزش)؛ بەردەم گرتن؛ ڕێ لێگرتن. (٢٣) دەستە (بلیت، پوول)؛ چوارپووڵ لاکێشەیی.
***v.t.*** (١) ڕێ لێگرتن؛ بەردەم گرتن؛ بەرگرتن؛ ڕێگە نەدان؛ ڕێ لێ بەستن: ***( to ~ someone, traffic, a plan, etc.)*** (٢) ئابلووقەدان؛ دەورەدان و ڕێی هاتوچۆ لێگرتن. (٣) بوون بە کۆسپ لەبەردەمدا. (٤) لە قاڵب دان؛ دارِشتن. (٥) بوون بە دەستە دەستە یا بەرە بەرە. (٦) پاڵپشت دانە بەر (دار، تەختە، ئاسن). (٧) لەکارخستن (کیمیاگەری). (٨) بەرەوبڕی دانەوە (وەرزش)؛ بەردەم گرتن. (٩) سڕکردن (پزیشکەوانی)؛ مراندن. (١٠) دەم بەستران (دەروونناسی)؛ لەبیرچوونەوە؛ بیر بۆ نەکرانەوە. (١١) شەمەندەفەر لێخوڕین بە چرای ئاگاداری.
***v.i.*** بەردەم گرتن (وەرزش)؛ بوون بە کۆسپ لەبەردەمدا؛ ڕێگەلێگرتن.
***adj.*** (١) خشت ئاسایی؛ وەك خشت. (٢) لاکێشەیی؛ چوارگۆشەیی (٣) تایبەتی بە ڕیزە خانوویەکی نێوان دوو شەقام؛ هی درێژی یا ماوەی ئەم ڕیزە خانووە. (٤) سەرووبەر؛ سەرجەم؛ بە کۆمەڵ. (٥) بە ڕیز یا بە ڕێکی چاپکراو (نامە).
**a chip of the old block,** کوتومت لە باوکی دەچێت لە ڕەووشت و ڕووخساردا.
**block in,** نەخشەی گشتی کێشان.
**block out,** (١) نەخشەی گشتی کێشان. (٢) بەردەم گرتن بۆ ئەوەی نەبینرێت؛ داپۆشین؛ لە مێشك لابردن یا لەبیر خۆ بردنەوە: ***( to block out a painful memory)*** .
**block up,** (١) بە خشت پڕکردنەوە. (٢) بەربەست کردن؛ ڕێ لێگرتن؛ بەردەم گرتن. (٣) بەرزکردنەوە و خستنەسەر خشت؛ لەسەر خشت دانان.
**go on the block,** (١) نیاز وایە سەربپڕێت؛ سەردەبڕێت؛ بۆ سەربڕین دانراوە: ***( The whole herd will go on the block tomorrow.)*** (٢) دەخرێتە مەزاتەوە؛ دەچێتە مەزاتەوە؛ هەراج دەکرێت: ***( The house will go on the block next week.)***
**on the block,** لە هەراجدایە؛ لە مەزاتدایە.
**blockade** (blo-kād'), ***n.*** (١) ئابلووقە؛ ئابلووقەدان؛ گەمارۆ. (٢) هێزی ئابلووقەدان. (٣) کۆسپ؛ قۆرت.
***v.t.*** (١) ئابلووقەدان؛ گەمارۆدان. (٢) ڕێ لێگرتن.
**run the blockade,** ئابلووقە شکاندن.
**blockade runner,** ئابلووقەشکێن (کەشتی، ئادەمیزاد).
**blockage** (blok'ij), ***n.*** (١) ڕێ لێگرتن؛ ڕێ لێ داخستن؛ بەرگرتن. (٢) ڕێگە گیران؛ ڕێگە داخران؛ کون گیران؛ بەرگیران؛ بەربەستی ***( a ~ in a blood vessel, water pipe, etc.)***
**block and tackle,** خولخولۆکە و پەت بۆ شت بەرزکردنەوە.
**blockbuster** (blok'bus´tēr), ***n.*** [Slang], (١) بۆمبایەکی گەورە و وێرانکەرە لە فڕۆکەی بۆمباهاوێژەوە بەردەدرێتەوە. (٢) شتێك یا کەسێکی زۆر بەکار و بەزەبر و سەرکەوتوو.
**blockhead** (blok'hed´), ***n.*** (١) پارچە دارێکی ستوونییە سەرەکەی لە شێوەی سەردایە شەپقەی لەسەر پیشان دەدرێت لە فرۆشگادا. (٢) کەسێکی کەودەن و بێ مێشك.
**blockhouse** (blok'hous'), ***n.*** (١) خانووی لە مووڕەدار درووست- کراو. (٢) قەڵایەکی دوونهۆمی لە مووڕەدار درووستکراو.
**blockish** (blok'ish), ***adj.*** (١) بڕەدار ئاسایی؛ وەك بڕەدار. (٢) کەر؛ کەودەن؛ بێ مێشك.
**block letter,** (١) تیپی لەسەر دار هەڵکەنراو. (٢) تیپی جیا جیا و گەورە و سادە.
**block plane,** ڕەندەی دارتاش.
**block signal,** چرای ڕاگەیاندنی خۆکاری سەر هێڵی شەمەندەفەر.
**block system,** شێوەی کارکردنی چرای ڕاگەیاندنی خۆکاری سەر هێڵی شەمەندەفەر.

**blocky** (blok′i), *adj.* (١) پەلەپەلە؛ پەلەپەلەو هەمەڕەنگ.
(٢) خرپنە؛ تۆکمە؛ پڕ؛ قەلەو. (٣) پارچە پارچەی گەورەی لێ دەبێتەوە.
**bloke** (blōk), *n.* [British Slang], کابرا؛ زەلام؛ پیاو؛ کەس؛ کوڕ.
**blond** (blond), *adj.* (١) قژزەرد. (٢) قژزەردی پێست سپی چاوشین.
(٣) کاڵ؛ ڕەنگ زەرد (کەلوپەل).
*n.* پیاو یا کوڕی قژزەردی پێست سپی.
**blonde** (blond), *adj.* = **blond.**
*n.* ئافرەتی قژزەردی پێست سپی؛ کچ یا ژنی قژزەرد.
**blood** (blud), *n.* (١) خوێن.
(٢) خوێن ڕشتن؛ کوشتن؛ پیاوکوشتن؛ خوێنی کەسێك.
(٣) ژین؛ ژیان؛ سەرچاوەو گەوهەری ژیان؛ پێویستی ژیان: *(lifeblood)* .
(٤) ئاروگ (ڕووەك). (٥) سرووشتی کەسی؛ سرووشتی خۆ؛ حەز؛ مەیل.
(٦) بنەچە؛ ڕیشە (٧) خزمایەتی.
(٨) پاش ڕەچەی پاشایی یا بەگزادەیی؛ بنەچەی پاشایی:
*( a princess of the ~ )*
(٩) ڕەگەز؛ ڕیشەی نەتەوایەتی.
(١٠) گیاندارێکی ڕەسەن (ئەسپ، سەگ).
(١١) فەرمانبەران؛ کاربەدەستان؛ کارگەران:
*( new ~ in the organization)*
(١٢) کەسێکی تەڕپۆش کە هەر خەریکی ڕابواردنە؛ کەسێکی سەرسەری.
**bad blood,** دوژمنایەتی؛ ناحەزی؛ قین؛ ڕق؛ کینە.
**blood is thicker than water,** هەستو پەیوەندی خزمایەتی بەهێزترە لە هی تر.
**have (someone's) blood on one's head,** خوێنی کەسێك لە ئەستۆدا بوون.
**in cold blood,** بە دەسەئەنقەستو ساردیو بێ هەستانە؛ بە هێمنیو بەبێ تووڕەبوون؛ بە بێ بەزەییيانە:
*( to kill someone in cold blood)*
**make bad blood between persons,** خەلك دان بە شەڕ.
**make one's blood boil,** زۆر ڕق هەڵسان؛ زۆر تووڕەکردن.
**make one's blood run cold,** زراوبردن؛ تۆقاندن؛ زۆر ترساندن.
**blood bank,** بانکی خوێن.
**blood bath,** لافاوی خوێن؛ قەلاچۆکاری؛ کوشتارێکی زۆر؛ خوێن ڕشتنێکی زۆر.
**blood brother,** (١) برای دایكوباوکی؛ برای هاوخوێن؛ برا.
(٢) کەسێك کە خوێنی لەگەڵ کەسێکی تردا تێکەڵاو دەکاتو وەك برایان لێ دێت.
**blood count,** ژمارەی خڕۆکەی سووروو سپی هەندێکی تایبەتی خوێنی مرۆڤێك
**blood-curdling** (blud′kûr′dliŋ), *adj.* زراوبەر؛ تۆقێنەر؛ زۆر ترسناك.
**blooded** (blud′id), *adj.* (١) جۆرێکی تایبەتی خوێنی هەیە:
*( a hot- ~ person)*
(٢) ڕەسەن (گیاندار).
**blood feud,** دوژمنایەتی کۆنی خێزانی یا خێڵەکی؛ دوژمنایەتی خێڵەکی.
**blood group,** جۆر یا پۆلی خوێن (یەکێکە لە چوار جۆر خوێن کە خوێنی هەمووکەس دەگرێتەوە).
**bloodguilty** (blud′gil′ti), *adj.* خوێنڕێژ؛ پیاوکوژ.
**blood heat,** پلەی گەرمی ئاسایی خوێنی مرۆڤ.
**bloodhound** (blud′hound′), *n.* (١) جۆرە سەگێکی گەورەی پێست لووسی بۆن تیژە (بۆ شوێن پێ هەڵگرتنو دۆزینەوەی تاوانباران)؛ سەگی چەش. (٢) پۆلیسی نهێنی؛ کەسێکی چەش یا کۆڵنەدەر.
**bloodily** (blud′′l-i), *adv.* (١) خوێنین؛ خوێناوی.
(٢) بە بێ بەزەییيانە؛ بە دڕندانە.

**bloodless** (blud′lis), *adj.* (١) بێ خوێن.
(٢) بەبێ خوێن ڕژان؛ بەبێ خوێن ڕشتن: *( a ~ revolution)* .
(٣) کەم خوێن (نەخۆشی)؛ زەرد؛ سپی هەڵگەڕاو.
(٤) بێ هێز؛ بێ تین؛ بێ تاقەت. (٥) بێ بەزەیی؛ دڵڕەق.
**bloodletting** (blud′let′iŋ), *n.* (١) خوێن بەردان (پزیشکەوانی).
(٢) خوێن ڕشتن؛ خوێن ڕژان.
**bloodline** (blud′līn′), *n.* بنەچە؛ بنەچەنامە؛ ڕەگەزنامە (بەتایبەتی هی گیاندار)؛ ڕەسەننامە (گیاندار).
**bloodmobile** (blud′mə-bēl′), *n.* ئوتومبیلی خوێن (بۆ خوێن لێ وەرگرتنو کۆکردنەوە لەوانەی خوێن دەبەخشن بە نەخۆش).
**blood money,** (١) خوێنبایی (خوێن بژاردنی کەسێکی بە ناڕەوا کوژراو). (٢) خوێنبایی (کرێی کوشتنی کەسێك کە پیاوکوژ وەری دەگرێت).
**blood plasma,** زەرداوی خوێن؛ پلازمای خوێن: بریتییە لە شلاوی خوێن کە خڕۆکە سوورو سپییەکانی تێدا نییە.
**blood poisoning,** ژەهراوی بوونی خوێن: نەخۆشییەکی خوێنە.
**blood pressure,** پەستانی خوێن؛ تەوژمی خوێن.
**blood-red** (blud′red′), *adj.* خوێنین؛ سوورە وەك خوێن.
**blood relation,** خزمی هاوخوێن؛ خزمێکە کە بە خوێن پێت بگات نەك لە ژنهێنان یا شووکردنەوە.
**blood revenge,** خوێن سەندن.
**bloodshed** (blud′shed′), *n.* خوێن ڕشتن؛ خوێن ڕژان؛ کوشتار؛ پیاوکوشتن.
**bloodshot** (blud′shot′), *adj.* خوێن تێزاو؛ سووربووەوە:
*( ~ eyes)*
**bloodstain** (blud′stān′), *n.* پەڵە خوێن؛ لەکەی خوێن.
*v.t.* خوێناوی کردن.
**bloodstained** (blud′stānd′), *adj.* (١) خوێناوی؛ پەڵە خوێنی پێوەیە. (٢) خوێنڕێژ؛ دەستی خوێناوییە؛ پیاوکوژ.
**bloodstone** (blud′stōn′), *n.* بەردێکی بەنرخی سەوزی تۆخە خاڵخاڵی سووری تێدایە؛ بەردەخوێن.
**blood stream,** خوێنی ناو دەمارەکانی لەش.
**bloodsucker** (blud′suk′ẽr), *n.* (١) زاروو؛ جانەوەرێکی خوێنخۆر.
(٢) کەسێکی پارەکێشەرەوە (بە زۆرو بە هەڕەشە).
(٣) لاوورگە؛ مشەخۆر؛ لاکوت؛ خۆرە.
**blood test,** تاقیکردنەوەی خوێن.
**bloodthirsty** (blud′thûrs′ti), *adj.* خوێنخۆر؛ خوێنمژ؛ خوێنڕێژ؛ دڕندە؛ بە خوێن تینوو.
**blood type,** جۆری خوێن؛ پۆلی خوێن.
**blood typing,** پۆلێنکردنی خوێن؛ هارپۆل کردنی خوێن.
**blood vessel,** دەماری خوێن؛ بۆری خوێن؛ دەزوولەی خوێن؛ خوێنبەر.
**bloody** (blud′i), *adj.* (١) خوێناوی؛ خوێنین.
(٢) خوێنی لێ دێت؛ خوێناوی: *( a ~ nose)* .
(٣) خوێنڕێژ؛ تایبەتی بە کوشتار. (٤) خوێنخۆر؛ خوێنمژ؛ دڕندە.
(٥) سوور. (٦) [British Slang]، بە لەعنەت؛ لەعنەتی.
*adv.* [British Slang], زۆر: *( He is a ~ good man.)* .
*v.t.* خوێناوی کردن؛ لە خوێن هەڵکێشان.
**bloom** (blōōm), *n.* (١) گوڵ؛ خونچە.
(٢) وەرزی گوڵ کردن؛ کاتی گوڵ کردنەوە.
(٣) گەنجێتی؛ لاوێتی؛ کاتی گەنجیو خۆشیو تەندروستی.
(٤) گەشێتی یا گەشانەوەی کوڵمو پێست.
(٥) تۆزی سەر هەندێك میوەو گەڵا (وەك تری، هەڵووژە).
*v.i.* (١) گوڵ کردن؛ خونچەکردن؛ پێگەیشتن؛ گوڵ گرتن؛ پشکوتن.
(٢) لە هەڕەتی گەنجیدا بوون؛ پێگەیشتن: *( She is ~ing.)* .
(٣) گەشانەوە (ڕەنگ، گەنجی، جوانی).
*v.t.* پێگەیاندن؛ پەرە پێ سەندن؛ گوڵ پێکردن؛ خونچە پێکردن.

**bloom** (bl o͞om), *n.* (١) پارچەیەك ئاسنی نەرم كە ئامادەیە بۆ
بەكارهێنانی بۆ شت لێ دروستكردن. (٢) شیشێكی ئاسن یا پۆڵا.
**bloomer** (bl o͞om'ẽr), *n.* (١) ڕووەكێكی گوڵدار یا خونچەدار.
(٢) كوڕێك یا كچێكی تازە پێگەیشتوو. (٣) [Slang]، هەڵە.
**bloomer** (bl o͞om'ẽr), *n.* بەرگێكی ژنانەیە بریتییە لە تەنوورەیەكی
كورت و پانتۆڵێكی دەلێ كە تەسك دەبێتەوە لە قولەقاچدا.
**bloomers** (bl o͞om'ẽrz), *n.pl.* (١) پانتۆڵێكی دەلبی كورتە لە ئەژنۆدا
دەبەسترێت، جاران كچان بۆ وەرزش لەبەریان دەكرد.
(٢) بەرگێكی ژێرەوەی كچانەیە لەم پانتۆڵە دەچێت.
**bloomery** (bl o͞om'ẽr-i), *n.* كوورەی دروستكردنی ئاسنی نەرم.
**blooming** (bl o͞om'iŋ), *adj.* (١) بەگوڵ؛ گوڵ گرتوو؛ بەخونچە؛
گوڵ بەدەم؛ پێگەییو؛ گەشاوە؛ پشكوتوو. (٢) لە پەرەسەندندایە؛ لەبرەودایە.
(٣) [Colloq.]، تەواو؛ یەكجار: *( He's a ~ fool.)* .
**bloomy** (bl o͞om'i), *adj.* (١) گوڵ بەدەم؛ خونچەی پێوەیە؛ بەگوڵ.
(٢) چینێك تۆزی وردی بەسەرەوەیە (وەك تری، هەڵووژە، هەندێك گەڵا).
**blossom** (blos'əm), *n.* (١) گوڵ: بەتایبەتی هی درەخت و ڕووەكی
بەردار؛ خونچە؛ گۆپكە؛ چرۆ. (٢) كاتی گوڵ كردن یا گەشانەوە؛
كاتی پشكوتن یا پێگەیین: *( peach trees in ~ )* .
*v.i.* (١) گوڵ گرتن؛ گوڵ كردن؛ خونچەكردن؛ پێگەیین؛ گەشانەوە (گوڵ).
(٢) پەرەسەندن؛ پێگەیشتن؛ گەشانەوە؛ گەورەبوون.
**blossomy** (blos'əm-i), *adj.* (١) خونچەیی؛ لە گوڵ چوو؛ گوڵ بەدەم.
(٢) خونچەدار؛ پڕ لە گوڵ؛ گوڵدار.
**blot** (blot), *n.* (١) پەڵەی مەرەكەب؛ لەكەی مەرەكەب: *( a ~ of ink)* .
(٢) (ا) وشەیەكی كوژاوە یا سڕاوە؛ لەكەیەكی لابراو.
(ب) شوێنی وشەیەكی كوژێنراوە یا لەكەیەكی لابراو.
(٣) شتێكی ناشرین كە بووبێت بە لەكە بۆ دەوروبەرەكەی:
*( That building is a ~ on the landscape.)*
(٤) لەكە (ناو، ناوبانگ)؛ شوورەیی: *( a ~ on a person's character)* .
(٥) كەسێكی لەكەدار یا شەرمەزار.
*v.t.* (١) لەكەداركردن؛ پیسكردن؛ پەڵەداركردن.
(٢) لەكەداركردن (ناو)؛ ناوپیسكردن؛ ئابڕووبردن.
(٣) ( ~ out )، كوژاندنەوە؛ سڕینەوە: *( to ~ out a word)* .
(٤) ووشك كردنەوە (بە كاغەزی ئاوهەڵچنە یا مژۆك).
*v.i.* (١) پەڵەپەڵەداركردن؛ لەكەداركردن.
(٢) پیس بوون؛ لەكەداربوون؛ پەڵەداربوون.
(٣) مژین؛ هەڵمژین.
**blot** (blot), *n.* (١) داشێكی دامەی بێ پاڵپشتە، واتە كە بەئاسانی بخورێت.
(٢) كەلەبەر؛ كەموكووڕی؛ شوێنێك یا خاڵێكی بێ هێز؛ كون وكەلەبەر؛ كون.
**blotch** (bloch), *n.* (١) زیپكە؛ پەڵەیەك یا پینەیەكی ناشرین بە پێستەوە.
(٢) پەڵەیەكی زل؛ لەكەیەكی گەورە.
(٣) پەڵەو پینەی ناشرین بە گەڵا و ڕووەكەوە (نەخۆشی).
*v.t.* پەڵەداركردن؛ پیسكردن؛ ناشرین كردن.
*v.i.* پەڵەداربوون؛ لەكەداربوون؛ پیس بوون؛ ناشرین بوون.
**-blotchy** *(adj.).*
**blotter** (blot'ẽr), *n.* (١) مژۆك؛ كاغەزی ئاوهەڵچنە یا ووشك كردنەوە.
(٢) تۆمارنامەی ڕووداوی ڕۆژانە:
*( A police ~ is a record of arrests and charges.)*
**blotting paper,** مژۆك؛ كاغەزی ئاوهەڵچنە یا ووشك كردنەوە.
**blotto** (blot'ō), *adj.* [Slang], زۆر سەرخۆش؛ كەیل.
**blouse** (blous, blouz), *n.* (١) كراسێكی ژنانەو منداڵانەی ئەختێك
دەلبی تا ئاوقەد یا خوارتر هاتوو. (٢) بلووز؛ جل وبەرگی سەرەوەی كرێكار.
(٣) چاكەتی كەشتیەوان و سەرباز.
(٤) بەرگی سەرەوەی كاری كەشتیەوان.
*v.i. & v.t.* گرمۆڵەكردن و گرێدان لە ئاوقەددا.
**blow** (blō'), *v.i.* (١) هەڵكردن (با): *( The wind ~s.)* .
(٢) فووكردن؛ فوولێكردن؛ فووتێكردن.
(٣) هەناسەبڕكێ پێكەوتن.
(٤) ژەندن (شمشاڵ، كەڕەنا)؛ فووپیاكردن (شاور، فیكە)؛ فیكەلێدان.
(٥) فیچقەكردن (نەهەنگ): *( Whales ~ .)* .
(٦) بابردن: *( The paper blew away.)* .
(٧) [Colloq.]، فشەكردن؛ خۆهەڵكێشان؛ خۆفشكردنەوە.
(٨) [Slang]، ڕۆیشتن (لە شوێنێك).
*v.t.* (١) دەماندن (مووشەدەمە). (٢) هەناسەدانەوە.
(٣) فووكردن؛ فووتێكردن. (٤) دەنگوباس بڵاوكردنەوە.
(٥) فووپێداكردن یا لێدان (شمشاڵ، كەڕەنا)؛ شاورلێدان؛ فیكەلێدان:
*( to ~ a trumpet, pipe, whistle, etc.)*
(٦) گەرم، سارد، یا فێنك كردنەوە (پانكە): *( to ~ air)* .
(٧) فووكردن لە ئاگر؛ ئاگر هەڵگیرساندن. (٨) فووتێكردن (تووڕەیی).
(٩) داڕشتن بە تەوژمی گڕو هەواپیاكردن (شووشە).
(١٠) فوولێكردن و پاكردنەوە؛ هەواپیاكردن بۆ پاكردنەوە.
(١١) لووت سڕین: *( B~ your nose!)* .
(١٢) ( ~ out ; ~ up )، تەقاندنەوە؛ ڕووخاندن (بە تەقەمەنی)؛ شەق پێ بردن.
(١٣) بەبادان؛ بابردن. (١٤) ڕەتاندن (ئەسپ).
(١٥) هێلكە تێداكردن. (١٦) سووتاندن (فیوز): *( It blew a fuse.)* .
(١٧) [Colloq.]، پارە بەبادان؛ پارە بەفیڕۆدان.
(١٨) [Colloq.]، ( ~ to )، میوانداری كردن؛ بانگ كردن بۆ نانخواردن.
(١٩) [Slang]، بەجێهێشتن (شوێن)؛ ڕۆیشتن.
(٢٠) [Vulgar Slang]، كێر لستنەوە: *( She blew him.)* .
(٢١) [Slang]، تێكدان (كار)؛ هەل لەدەستدان: *( You blew it!)*
*n.* (١) (ا) هەڵكردن (با). (ب) فوو؛ فوولێكردن؛ فووكردن. (ج) فووپێداكردن.
(٢) با؛ بایەكی قایم؛ ڕەشەبا. (٣) فشە؛ خۆهەڵكێشان.
(٤) [Slang]، كەسێكی فشەباز؛ فشەچی؛ فشەكەر.
**blow hot and cold,** ڕاڕایی كردن؛ دوودڵی كردن.
**blow in, [Slang],** (١) لەپڕ گەیشتنە شوێنێك.
(٢) هەموو پارەی خۆ بەبادان.
**blow off,** (١) بەرەڵاكردنی هەڵم یا ئاوی گەرم (لە بەرمیلی كوڵاندن).
(٢) [Colloq.]، خەفەت هەڵڕشتن (بە قسەكردن یا هاواركردن)؛ دڵ هەڵڕشتن؛
خەفەت بەبادان.
**blow out,** . *( to blow out a candle)* (١) كوژاندنەوە (بە فوولێكردن):
(٢) تەقین (تایە). (٣) فیچقەكردن لەپڕو بە قایم (هەڵم، هەوا).
(٤) سووتان (فیوزی كارەبا).
(٥) شكان (ئامێری كارەبایی)؛ لەكاركەوتن.
**blow over,** (١) تێپەڕبوون (هەوری باراناوی، باوباران).
(٢) لەبیرچوونەوە؛ لەبیرنەمان؛ ڕابوردن.
**blow up,** (١) فووتێكردن؛ فشكردنەوە؛ هەواتێكردن.
(٢) تەقین؛ شەق بردن. (٣) هەڵكردن و بەهێزتر بوون (با، گەردەلوول)
(٤) [Colloq.]، سەرزەنشت كردن بەتوندی.
(٥) [Colloq.]، تووڕەبوون؛ هەڵچوون: *( He blew up in her face.)* .
(٦) گەورەكردن (وێنە): *( to blow up a photograph)* .
**blow** (blō), *n.* (١) مستەكۆڵە؛ زللە؛ بۆكس؛ لێدان (بە دار یا كوتەك):
*( a heavy ~ on the head)*
(٢) هێرشێكی لەناكاو و كوتوپڕ.
(٣) لێقەومانێكی كوتوپڕ؛ ڕووداوێكی ناخۆش و لەناكاو:
*( His wife's death was a great ~ to him. ; a ~ to his ego)*
**at a (or one) blow,** بە یەك جار؛ بە یەك كەڕەت.
**come to blows,** بەیەكداكێشان؛ لە یەكتر هەڵدان؛
بەربوونە یەكتر بە مستەكۆڵە.
**without striking a blow,** بەئاسانی؛ بەبێ هەوڵدان؛ بەبێ ماندووبوون.
**blow** (blō), *v.i.* خونچەكردن؛ كرانەوە (گوڵ، خونچە)؛ پشكوتن.
*v.t.* گوڵ پێكردن؛ خونچە پێكردن؛ هێنانە پشكوتن.

***n.*** (١) گوڵو خونچەی زۆر (٢) پیشاندانێك یا نواندنێکی جوانو نایاب.
**blower** (blō′ẽr), ***n.*** (١) فووکەر؛ فووپیاکەر؛ فووتێکەر.
(٢) پانکە؛ ئامێری هەوابزوێن یا دەماندن (پانکە، مووشەدەمە... هتد).
(٣) [Slang]، فشەکەر؛ فشەچی.
**blowfly** (blō′flī′), ***n.*** مێشێکە هێلکە لەناو گۆشتو برینداد دەکات.
**blowgun** (blō′gun′), ***n.*** (١) تفەنگی هەڵپرژێنەر: ئامێرێکە بۆیەو شتی وەهای پێ هەڵدەپرژێنرێت بەهێزی بای پەستێوراو؛ فیچقە
(٢) تفەنگی فووپیاکردن: بۆرییەکە بە فوو تۆپی بچووکی پێ دەهاوێژرێت.
**blowhard** (blō′härd′), ***n.*** [Slang], کەسێکی فشەکەر.
**blowhole** (blō′hōl′), ***n.*** (١) کونەلووتی نەهەنگ (کە هەناسەی لێوە دەدات و فیچقەکەی لە دوورەوە دەبینرێت). (٢) ڕێگەدەری هەواو گاز؛ کونی هەوا دەرچوون. (٣) کونێکە لە سەهۆڵدا نەهەنگو مانگای دەریایی و دۆلفین سەری لێوە دەهێننە دەرەوە بۆ هەناسە وەرگرتن.
**blowjob** (blō′job′), ***n.*** [Vulgar Slang]. کێر لستنەوە
**blown** (blōn), *past participle of* **blow.**
***adj.*** (١) فووتێکراو؛ ئاوساو. (٢) هەناسەبڕکێ پێکەوتوو؛ هەناسە سواربوو.
(٣) هێلکەی مێشی پێوەیە. (٤) بە تەووژمی گەرماو با کراوە یا داڕێژراوە (شووشەی هەمەشێوەو نەخشە).
**blown** (blōn), *past participle of* **blow.**
***adj.*** پێگەیشتوو؛ گوڵ بەدەم؛ پشکوتوو؛ گوڵو خونچە گرتوو.
(گەلێك جار وشەی " **full-blown** " بەکاردێت).
**blowoff** (blō′ôf′), ***n.*** (١) فیچقەکردن (ئاو، هەلم).
(٢) ئامێری فیچقەپێکردن. (٣) [Slang]، فشەکەر؛ فشەچی.
**blowout** (blō′out′), ***n.*** (١) لەپڕ تەقینەوە یا بەربوونی گازو هەوا.
(٢) (أ) تەقینی تایە (ئۆتومبیل یا فڕۆکە). (ب) کونی تایەی تەقیو.
(ج) تایەی تەقیو. (٣) فیوز سووتان
(٤) [Slang]، ئاهەنگی نانخواردن؛ زەماوەند.
**blowpipe** (blō′pīp′), ***n.*** (١) بۆری فووکردن (کە زەڕەنگەر بەکاری دەهێنێت بۆ ئاگرخۆش کردن)؛ ئاگرخۆشکەرە. (٢) **blowtube** .
(٣) **blowgun** .
**blowtorch** (blō′tôrch′), ***n.*** شاپلیتەی لەحیم کردن.
**blowtube** (blō′tōōb′, blō′tūb′), ***n.*** شاپلیتەیەکە شووشەی پێ دەتوێنرێتەوەو شتی هەمەجۆری لێ درووست دەکرێت.
**blowup** (blō′up′), ***n.*** (١) تەقین؛ تەقینەوە؛ تەقە.
(٢) [Colloq.]، هەڵچوون؛ تەقینەوە (هەست، تووڕەیی، شەڕ، دەمەقاڵێیەکی خراپ)؛ نەرەنەڕو هاوارکردن بەسەر یەکدا: *( They had a ~ .)* .
(٣) وێنەی گەورەکراو: *( I want a ~ of this photo.)* .
**blowy** (blō′i), ***adj.*** باداوی؛ بای هەیە.
**blowzed** (blouzd), ***adj.*** = **blowzy.**
**blowzy, blowsy** (blouz′i), ***adj.*** (١) قەڵەو و کوڵم سوورو گووپن.
(٢) پیس‌وپۆخڵ؛ چەپەڵ؛ پنتی؛ بژ: *( ~ hair)*
**blubber** (blub′ẽr), ***n.*** (١) لەبە؛ غەزوبەز؛ چەوری لەش.
(٢) غەزوبەزی نەهەنگو گیانداری تری ئاوی.
**blubber** (blub′ẽr), ***v.i.*** گریان بەکوڵو بە هەنسك دانەوە
***v.t.*** (١) قسەکردن بە دەم گریانێکی بەکوڵو هەنسك دانەوە:
*( The child ~ed out his name.)*
(٢) تەڕکردنو ئاوساندن بە گریان.
**blubbery** (blub′ẽr-i), ***adj.*** (١) لەبەدار؛ غەزوبەزاوی.
(٢) چەور؛ وەك لەبە وایە. (٣) ئاوساو و سووربووەوە (بە گریان).
**blucher** (blōō′chẽr, blōō′kẽr), ***n.*** (١) جزمەی لاسك کورت.
(٢) پێڵاوێکە سەرەکەی و زمانەکەی یەك پارچەن.
**bludgeon** (bluj′ən), ***n.*** کوتەك؛ مێکوت.
***v.t. & v.i.*** (١) بە کوتەك لێدان؛ بە مێکوت پیاماڵین.
(٢) هەڕەشەلێکردن؛ بەچەترسێن کردن؛ زۆرلێکردن.
**blue** (blōō), ***adj.*** (١) شین؛ شینی ئاسمانی. (٢) شین هەڵگەڕاو (پێست).
(٣) (أ) خەفەتبار؛ غەمبار؛ دڵتەنگ: *( I am feeling ~ .)* .
(ب) ناخۆش؛ پەستکەر: *( a ~ day)* .
(٤) توندوتیژ؛ بەزەبر؛ ڕێگەنەدەر بە بەرەڵایی: *( ~ laws)* .
(٥) شین پۆش. (٦) بەگزادە؛ خانەدان.
(٧) پۆشنبیر (ئافرەت).
(٨) [Colloq.]، بێ پەردە؛ ناشرین (ووتە، نوکتە)؛ پیس: *( a ~ joke)* .
***n.*** (١) ڕەنگی شین؛ شینی ئاسمانی؛ شین. (٢) بۆیەی شین؛ خومی شین.
(٣) شتێکی شین یا شین کراو. (٤) کەسێکی شین پۆش. (٥) کەشتییەوان.
(٦) (*pl.*)، [Slang]، جل‌وبەرگی کەشتییەوان (کە ڕەنگەکەی شینە).
***v.t.*** شین کردن؛ ڕەنگ شین کردن؛ خومی شین لێدان.
***v.i.*** شین بوون؛ شین هەڵگەڕان؛ شین بوونەوە.
**once in a blue moon,** بە دەگمەن؛ زۆر بە دەگمەن؛ زۆر کەم (ڕوودان).
**out of the blue,** لە هیچەوە؛ لە هیچی نەبوو؛ لە خوت‌وخۆڕایی.
**the blue,** (١) ئاسمان. (٢) دەریا.
**the blues,** (١) [Colloq.] ، غەمباری؛ خەفەتباری؛ دڵتەنگی.
(٢) جۆرە گۆرانی و مۆسیقایەکی قولەڕەشەکانی ئەمەریکایە وەك لاوانەوە وایە غەمباری دەردەبڕێت.
**blue baby,** منداڵێکی ساوایە کە هەر بە زگماکی نەخۆشی پێست- شین بوونەوەی لەگەڵدایە.
**bluebeard** (blōō′bêrd′), ***n.*** ژنی خۆکوژ یەك لەدوای یەك؛ ژن کوژ.
**bluebell** (blōō′bel′), ***n.*** گوڵەزەنگ؛ گەزیزە؛ ڕووەکێکە گوڵی ڕەنگینی زەنگوڵەیی دەگرێت.
**blueberry** (blōō′ber′i, blōō′bẽr-i), ***n.*** تووترك (بەرو ڕووەك).
**bluebird** (blōō′bũrd′), ***n.*** باڵندەیەکی ئەختێك لە چۆلەکە گەورەتری پشت شینی سنگ سوورکاری دەنگخۆشە.
**blue-black** (blōō′blak′), ***adj.*** ڕەشێکی تۆخ؛ زۆر ڕەش.
**blue blood,** (١) بەگزادەیی؛ خانزادەیی.
(٢) خانزادەیەك؛ کەسێکی بەگزادە.
**blue-blooded** (blōō′blud′id), ***adj.*** (١) خانزادە؛ بەگزادە.
(٢) ڕەسەن.
**bluebonnet** (blōō′bon′it), ***n.*** (١) کڵاوێکی خوری شینی- ئوسکوتلەندییە. (٢) کڵاولەسەرێکی وەها؛ ئوسکوتلەندی.
(٣) ڕووەکێکی گوڵ شینە.
**blue book,** (١) بڵاوکراوەیەکی بەرگ شینی پەرلەمانی ئینگلیزییە.
(٢) تۆمارنامەی ڕەسمی ناوی کاربەدەستانی ئەمەریکا؛ ڕابەرنامەی ئەم ناوانە.
(٣) تۆمارنامەی کەسانی بەناوبانگ؛ ڕابەرنامەی ناوی ناوداران.
(٤) پەڕاوێکە قوتابی زانکۆ تاقیکردنەوەی لەسەر دەنووسێت.
**bluebottle** (blōō′bot′l), ***n.*** (١) ڕووەکێکی گوڵ ڕەنگینە.
(٢) مێشێکی گەورەی ژێرسك شینی تووکاوییە.
**bluecap** (blōō′kap′), ***n.*** (١) جۆرێکە لە باڵندە. (٢) **bluebonnet** .
**blue cheese,** پەنیری شین: پەنیرێکی شلە دەکرێت بەسەر زەڵاتەدا.
**blue-chip** (blōō′chip′), ***adj.*** (١) تایبەتی بە بەشی بەبرەو یا بەنرخ (بازاڕی پارەبازی یا بۆرسە): *( a ~ stock)* .
(٢) [Colloq.]، نایاب؛ بەنرخ.
**bluecoat** (blōō′kōt′), ***n.*** پۆلیس.
**blue-collar** (blōō′kol′ẽr), ***adj.*** تایبەتی بە کرێکاران؛ تایبەتی بە ڕەنجدەران: *( a ~ worker; ~ wages)* .
**blue devils,** (١) زڕەخەو و وڕێنە.
(٢) [Colloq.]، پەستی؛ غەمباری؛ خەفەت.
**bluefish** (blōō′fish′), ***n.*** ماسییەکی شینو خۆڵەمێشییە.
**bluegrass** (blōō′gras′, blōō′gräs′), ***n.*** (١) گیایەکی تۆخی شینکارە. (٢) مۆسیقایەکی فۆلکلۆری یا خۆواڵتی خواروی ئەمەریکایە (بەتایبەتی " کەنتاکی " ) کە بە ئامێری ژێدار لێ دەدرێت وەك " گیتار " و " بانجۆ " .

**blueish** (bl**ōō**′ish), *adj.* = **bluish.**
**bluejack** (bl**ōō**′jak′), *n.* داربەڕوویەکی بچووکی ئەمەریکییە.
**bluejacket** (bl**ōō**′jak′it), *n.* سەربازی دەریایی (ئەمەریکی یا ئینگلیزی)
**bluejay** (bl**ōō**′jā′), *n. Also* **blue jay,** باڵندەیەکی شینی پۆپنەدارە ئەختێك لە چۆلەکە گەورەترە زۆر دەخوێنێت.
**blue jeans,** جۆرە پانتۆڵێکی شینی کەتانی زۆر قایمە.
**blue laws,** یاسای بەزەبرو توندوتیژ (کە سەماو خواردنەوەو ڕابواردن قەدەغە دەکات لە ڕۆژی یەك شەممەدا لە وڵاتە خاچ پەرستەکاندا).
**bluenose** (bl**ōō**′nōz′), *n.* [Colloq.], کەسێکی مێشك تەسكو توندوتیژ (لە هەڵوێستیدا دەربارەی ڕەووشتی مرۆڤ).
**blue-pencil** (bl**ōō**′pen′s'l), *v.t.* بژارەکردن (دەستنووس، نووسراو)؛ هەڵەبڕکردن.
**blue peter,** ئاڵایەکی شینە چوارگۆشەیەکی سپی لە ناوەڕاستەکەیدایە (نیشانەی ئەوەیە کە کەشتییەك خەریکە بکەوێتە ڕێ).
**bluepoint** (bl**ōō**′point′), *n.* گوێچکەماسییەکی بچووکە بە کاڵی دەخورێت
**blueprint** (bl**ōō**′print′), *n.* (١) نەخشەی خانووسازی.
(٢) نەخشە؛ نەخشەی وورد.
*v.t.* نەخشەکردن؛ نەخشەکردن بەووردی.
**blue ribbon,** (١) خەڵاتێکی بەرزی ئینگلیزییە.
(٢) (ا) شریتی شین: خەڵاتێکە دەدرێت بە براوەی یەکەم.
(ب) خەڵاتی یەکەم؛ پاداشتی یەکەم.
(٣) دروشمی هەندێك کۆمەڵەی دژ بە عەرەق و مەی خواردنەوەیە.
**blue-sky law,** یاسای پاراستنی خەڵك لە ساختەبازی لە بازاڕی پارەبازیدا
**bluestocking** (bl**ōō**′stok′iŋ), *n.* ژنێکی ڕۆشنبیر یا زانا
**bluestone** (bl**ōō**′stōn′), *n.* (١) بەردێکی لمینی شین و بۆرە.
(٢) **blue vitriol**
**blue streak,** (١) شتێکی وەك چەخماخە خێرا.
(٢) ڕستەیەك ووشەی دوایی نەهاتوو.
**blue vitriol,** زاخی شین.
**bluff** (bluf), *v.t. & v.i.* (١) بلۆف لێدان؛ کەڵەك لێکردن؛ خەڵەتاندن.
(٢) ترساندن (بە هەڕەشەیەك کە ناتوانرێت بهێنرێتە دی).
(٣) خەڵەتاندن (قومار).
*n.* (١) بلۆف؛ ساختە؛ بە درۆ شت بردنەسەر؛ کەڵەك.
(٢) بلۆفچی؛ ساختەچی؛ ساختەباز.
**bluff** (bluf), *adj.* (١) لێژو سەرتەخت و پان (قەدپاڵ، گرد، کەندەڵان).
(٢) قسەلەڕوو؛ قسەڕەق.
*n.* قەدپاڵێکی لێژی سەرتەخت و پان؛ تەختاییەکە کە دیونکی کەندەڵان بێت.
**bluffer** (bluf′ẽr), *n.* بلۆفچی؛ ساختەچی؛ درۆزن.
**bluing, blueing** (bl**ōō**′iŋ), *n.* بۆیە، خوم، یا شلە سابوونێکی شینە جل وبەرگی سپی پێ دەشۆرێت بۆ ئەوەی زەرد نەبێت.
**bluish, blueish** (bl**ōō**′ish), *adj.* شینباو؛ شینکار
**blunder** (blun′dẽr), *v.i.* (١) هەڵەی گەورە کردن؛ هەڵەکردن.
(٢) پێ داچوون؛ پێ هەڵکەوتن؛ لەتردان.
*v.t.* (١) ( **out** ~ )، بە تێکەڵی وپێکەڵی و گەوجانە بێژان؛ لە دەم دەرچوون بەبێ بیرلێکردنەوە. (٢) تێکدان (کار)؛ تێکەڵ وپێکەڵ کردن.
*n.* هەڵەیەکی گەورە؛ هەڵەیەکی زۆر خراپ؛ هەڵە.
**blunderbuss** (blun′dẽr-bus′), *n.* (١) تفەنگێکی کۆنباوی کورتی لووت پانە (٢) کەسێکی زۆر هەڵەکەر؛ کەودەن.
**blunge** (blunj), *v.t.* قوڕەسوورگرتنەوە (گۆزەو دیزەکاری).
**-blunger** *(n.).*
**blunt** (blunt), *adj.* (١) نازیرەك؛ کەودەن؛ بێ مێشك؛ کۆڵ.
(٢) کوڵ؛ سووراو: *( a ~ knife)* . (٣) قسەلەڕوو؛ قسەڕەق.

*v.t.* (١) کول کردن (تیغ).
(٢) هەست مراندن؛ هەست کوشتن؛ بێ هەست کردن.
*v.i.* (١) کول بوون. (٢) هەست مردن؛ بێ هەست بوون.
**blur** (blũr), *v.t.* (١) لەکەدارکردن؛ لکاوی کردن؛ پیس کردن.
(٢) لێڵ کردن (مەسەلە، باس)؛ شێواندن؛ تێکدان: *( to ~ an issue)* .
(٣) کزکردن (چاو، بینایی)؛ کەمکردنەوە (توانای مێشك).
*v.i.* (١) لەکەداربوون؛ پیس بوون (٢) لێڵ بوون (مەسەلە، باس).
*n.* (١) پەڵە؛ لەکە؛ پیسی.
(٢) شتێکی لێڵ (بۆ بینینی یا تێگەیشتنی)؛ شتێکی نادیار.
**blurb** (blũrb), *n.* (١) پێناسینێکی پڕ لە ستایشی پەڕتووکێك کە لەسەر بەرگەکەی چاپ دەکرێت. (٢) بڵاوکەرەوەیەکی کورتی ستایشی.
**blurry** (blũr′i), *adj.* (١) (ا) لێڵ (وێنە، باس): *( a ~ picture)* .
(ب) کزبوون یا بەرگیراو بە فرمێسك: *( ~ eyes)* .
(٢) لەکاوی؛ پەڵەی پیسی پێوەیە.
**blurt** (blũrt), *v.t.* ( ~ out ), لە دەم دەرچوون بەبێ بیرلێکردنەوە؛ قسە دەرپەڕاندن: *( to ~ out a secret)* .
**blush** (blush), *v.i.* (١) ڕەنگ سوورهەڵگەڕان (لە شەرم، تەریق بوونەوە، یا سەر لێ تێکچووندا). (٢) ( **at** ~ ; **for** ~ )، تەریق بوونەوە؛ شەرمەزاربوون.
(٣) سووربوونەوە؛ وەك گوڵی سوور لێهاتن.
*v.t.* (١) دەرخستن یا درکاندن بە ڕەنگ سوورهەڵگەڕان (٢) سوورکردن.
*n.* (١) ڕەنگ سوورهەڵگەڕان (شەرم، تەریقی؛ سەر لێ شێوان).
(٢) ڕەنگی سووری وەك گوڵ: *( the ~ of youth)* .
**at first blush,** لە یەکەم سەیرکردندا.
**blushful** (blush′fəl), *adj.* شەرمن؛ ڕەنگ سوورهەڵگەڕاو.
**bluster** (blus′tẽr), *v.i.* (١) هەڵکردن بە قایم (با).
(٢) فشەفش کردن بە دەنگی بەرز؛ خۆبادان؛ هەراهەراکردن.
(٣) هەڕەشەی پڕوپووچ کردن.
*v.t.* (١) بەچەترسێن کردن؛ ترساندن؛ چاوترساندن و بە زۆر پێکردن (بەدکاری).
(٢) بە دەنگی بەرزو بە تووڕەیی یەوە وتن؛ بە توندوتیژی بێژان.
*n.* (١) دەنگی باوبۆران. (٢) دەنگەدەنگێکی زۆر؛ هەراوزەنا؛ بەزموڕەزم.
(٣) هەڕەشەوگوڕەشە؛ فشەفش بە دەنگی بەرز.
**-blusterous; blustery** *(adj.).*
**blvd.,** = **boulevard.**
**boa** (bō′ə), *n.* (١) جۆرە مارێکی گەورەی بێ ژەهرە خۆی لە نێچیرەکەیەوە دەپێچێت و دەیپسێنێت و دەیکوژێت و قووتی دەدات. (٢) ملپێچێکی درێژی ژنانەیە (لە فەروو یا پەڕ درووست دەکرێت).
**boa constrictor,** جۆرە مارێکی گەورەو درێژو بێ ژەهری ناوچە گەرمەکانە خۆی لە نێچیرەکەیەوە دەپێچێت و دەیپسێنێت و دەیکوژێت و قووتی دەدات.
**boar** (bôr, bōr), *n.* یەکانە؛ بەرازەکێوی.
**board** (bôrd, bōrd), *n.* (١) تەختەدار؛ تەختە؛ پارچەیەك تەختەی باریك و تەنك و درێژە.
(٢) تەختەیەکی لاکێشەییە بۆ بەکارهێنانی جۆراوجۆر: *( a bulletin ~ ; an ironing ~ )*
(٣) مقەبا. (٤) مێزی نانخواردن؛ خوان.
(٥) نانی سەر خوان؛ خواردەمەنی سەر مێز.
(٦) خۆراکی ڕۆژانەی بە پارە دراو بە میوان (لە ماڵێکی کرێ، میوانخانە، یا لە خانەی قوتابیاندا): *( room and ~ )* .
(٧) مێزی کۆڕ؛ مێزی کۆبوونەوە.
(٨) ئەنجوومەن؛ دەستەی بەڕێوەبەران؛ لیژنەی کارگێڕی: *( a ~ of education ; the ~ of directors)*
*v.t.* (١) ( **up** ~ )، بە تەختە گرتن، داپۆشین، یا بەرگرتن: *( to ~ up windows for fear of violence)*
(٢) خواردن یا خواردن و جێگەی نووستن پێدان بۆ ماوەیەك بە پارە: *( to ~ travellers)*

(٣) دانانی کەسێك لە ماڵێکدا کە خواردنی تیا بخوات بە پارە بۆ ماوەیەك:
*( He ~ed his son there.)*

*v.i.* خواردن یا خواردن‌و جێگەی نووستن دەست کەوتن بە پارە بۆ ماوەیەك لە ماڵێك یا میوانخانەیەکدا.

**across the board,** (١) گرەوی براوە (پێشبڕکێی ئەسپ‌و سەگ).
(٢) گشتی‌و یەکسانی؛ وەك یەك هەمووکەس دەگرێتەوە:
*( to raise salaries across the board)*

**the boards,** شانۆ.

**tread the boards,** خۆنوواندن لەسەر شانۆ.

**board** (bôrd, bōrd), *n.* (١) لا (کەشتی)؛ تەنیشت: *(overboard)*.
(٢) کەنار؛ قەراغ: *(seaboard)*

*v.t.* (١) هاتنە تەنیشت کەشتی‌یەوە (بە نیازی خراپ).
(٢) بە زۆرەملێ سواری کەشتی بوون (بۆ پشکنین یا شتی تر).
(٣) سواربوون (کەشتی، فڕۆکە، پاس، شەمەندەفەر):
*( The passengers ~ed the plane, train, ship, etc.)*
(٤) بانگ کردن بۆ قسە لەگەڵ کردن؛ بانگ کردن‌و قسە لەگەڵ کردن.

**go by the board,** (١) کەوتنەخوارەوەو ناوبردن (لە کەشتی یا بەلەم).
(٢) فەوتان؛ سەرنەگرتن؛ بە ئەنجام نەگەیشتن؛ بایەخ پێ نەدران:
*( All his work and efforts went by the board.)*

**boarder** (bôr′dēr, bōr′dēr), *n.* (١) کەسێك کە خواردن لە ماڵێکدا دەخوات یا دەخوات‌و دەنوێت بە پارەیەکی بڕاوە. (٢) قوتابی ناوخۆ.

**boarder** (bôr′dēr, bōr′dēr), *n.* کاربەدەستێکە کە سواری کەشتی یا فڕۆکەی دوژمن دەبێت بۆ پشکنین (ئەگەر پێویستی کرد بە زۆر).

**board foot,** پێوانەیەکی تەختەیە بریتی‌یە لە یەك پێ دووجاو یەك گرێ ئەستووری

**boarding** (bôrd′iŋ, bōrd′iŋ), *n.* (١) شتێکی لە تەختە دروست- کراو. (٢) تەختە؛ دارو تەختە

**boarding** (bôrd′iŋ, bōrd′iŋ), *n.* (١) سواربوون (ئوتومبیل، فڕۆکە، کەشتی، پاپۆڕ، شەمەندەفەر).
(٢) هێرش بردنەسەر یا سواربوون‌و گرتنی کەشتی‌یەك.

**boardinghouse** (bôrd′iŋ-hous′, bōrd′iŋ-hous′), *n. Also* **boarding house,** خانووی خواردن‌و نووستن بە کرێیەکی بڕاوەی هەفتانە یا مانگانە؛ میوانخانەی شەووڕۆژی بە پارە.

**boarding school,** قوتابخانەی خانەخۆ؛ بەشی نووستن‌و نانخواردنی قوتابخانە

**board of trade,** (١) ئەنجوومەنی بازرگانی.
(٢) [B- T-]، ئەنجوومەنی بازرگانی‌و پیشەسازی ئینگلتەرە.

**boardwalk** (bôrd′wôk′, bōrd′wôk′), *n.* (١) پیادە ڕێگەیەکە لە تەختەی ئەستوور دروستکراوە (٢) پیادە ڕێگەیەکە لە تەختەی ئەستوور دروستکراوە لە کەناری دەریادا

**boarhound** (bôr′hound′, bōr′hound′), *n.* سەگێکی زل ڕاوە بەرازە

**boarish** (bôr′ish, bōr′ish), *adj.* یەکانەیی؛ بەرازی؛ چوارپێ؛ دڕندە؛ کێرچڵێس.

**boast** (bōst), *n.* (١) گەزاف؛ فشە؛ فشەفش؛ خۆبادان؛ خۆهەڵکێشان.
(٢) شتێك کە فشەی پێوە بکرێت یا خۆی پێوە هەڵبکێشرێت.

*v.i. & v.t.* گەزاف لێدان؛ خۆهەڵکێشان؛ خۆفشکردنەوە؛ فشەکردن.

**boast** (bōst), *v.t.* گەلاڵەکردنی پەیکەر.

**boastful** (bōst′fəl), *adj.* فشەکەر؛ گەزاف لێدەر؛ خۆهەڵکێش.

**boat** (bōt), *n.* (١) بەلەم (هی بایەوان، سەوڵ، یا مەکینە).
(٢) کەشتی؛ پاپۆڕ
(٣) قاپی وەك بەلەم: دەفرێکی بچووکی قووڵە شلەی تێ دەکرێت.

*v.t.* خستنەناو بەلەمەوە؛ هەڵگرتن بە بەلەم *( B~ the oars.)*.

*v.i.* بە بەلەم گەڕان‌و گەشتکردن. *( to go ~ing)*.

**in the same boat,** هاودەرد؛ دووچاری هەمان گیروگرفتن؛ هەمان بارودۆخ.

**boathouse** (bōt′hous′), *n.* گەراجی بەلەم؛ مۆڵگەی بەلەم (خانوو).

**boating** (bōt′iŋ), *n.* (١) بە بەلەم گەڕان‌و گەشتکردن؛ سواربوونی بەلەم.
(٢) بەلەم؛ بەلەمەکان بەگشتی.

**boatload** (bōt′lōd′), *n.* (١) پڕ بەلەمێك (بار یا ئەفەر).
(٢) باری بەلەمێك؛ بارگەی بەلەم؛ پڕ بەلەمێك.

**boatman** (bōt′mən), *n.* بەلەموان؛ بەلەمچی؛ کەسێك کە بەلەم لێ- دەخوڕێت، ئیشی لەسەر دەکات، دەیفرۆشێت، یا بە کرێی دەدات.

**boatsman** (bōts′mən), *n.* = **boatman.**

**boatswain** (bō′s'n, bōt′swān′), *n. Also* **bosun,** سەرکاری کەشتی‌یەوانان.

**boat train,** شەمەندەفەری هاتوچۆی ئەفەر لەنێوان کەشتی‌و ناوشاردا.

**bob** (bob), *n.* (١) [British Dial.]، هێشوو؛ بۆڵی شۆڕبووەوە.
(٢) تۆپەڵەقژ؛ کاکۆڵ. (٣) قژی کورت (بەتایبەتی هی ژن‌و منداڵ)؛ سەرتاشینێکی کورت. (٤) کلکی بڕاو یا کورتکراوەی ئەسپ.
(٥) گوێزەکەی شیرەخۆرە. (٦) ڕاوەشاندن؛ تەکان؛ جووڵە.
(٧) تەپەدۆری سەر قولاپی ڕاوەماسی.
(٨) پیاکێشانێکی بەئەسپایی؛ بەناستەم لێدان.
(٩) جۆرە سەمایەکی ئوسکوتلەندی‌یە.
(١٠) گالیسکە بەفرینە؛ دوو گالیسکە بەفرینەی پێکەوەبەستراو
(١١) کڕنووش بردنێکی پەلەی کچ.

*v.t.* (١) لێدان بەئەسپایی؛ بەئەسپایی پیاکێشان.
(٢) ڕاوەشاندن (بەتایبەتی سەر)؛ جووڵاندنەوە.
(٣) کورتکردنەوە (قژ)؛ قژ زۆر کورت بڕین.

*v.i.* (١) بەرزو نزم بوونەوە؛ لەرینەوە.
(٢) کڕنووش بردن (کچ)؛ بەسەر سڵاوکردن.
(٣) ( ~ **for** )، خۆهەڵدان‌و بە دەم گرتنەوەی میوەی شۆڕبووەوە یا بە هەواوە.
(٤) سەماکردن؛ هەڵبەزین‌و دابەزین.
(٥) ( ~ **up** )، لەپڕ سەرهەڵدانەوە پاش بەزینێك یا ژێرکەوتنێك.

**bob up.** لەپڕ سەرهەڵدان؛ لەناکاو دەرکەوتن یا هاتنەڕوو.

**bob** (bob), *n.pl.* [British Slang], شلنگ: پارەیەکی ئینگلیزی‌یە.

**bobbed** (bobd), *adj.* کاکۆڵدار؛ کورت (قژی ژن‌و منداڵ).

**bobbery** (bob′ĕr-i), *n.* پشێوی؛ ئاژاوە؛ هەراوهوریا.

**bobbin** (bob′in), *n.* بەکرە.

**bobby** (bob′i), *n.* [British Slang], پۆلیس.

**bobby pin,** تەوقەی سەر.

**bobby socks,** [Colloq.], گۆرەوی کورتی ژنانە.

**bobby soxer,** هەرزەکچ (بەتایبەتی هی شوێن مۆدە کەوتوو).

**bobcat** (bob′kat′), *n.* پشیلەکێوی.

**bobsled** (bob′sled′), *n.* گالیسکە بەفرینە؛ دوو گالیسکە بەفرینەی پێکەوەبەستراو.

*v.i.* سواری گالیسکە بەفرینە بوون.

**bobsleigh** (bob′slā′), *n. & v.i.* = **bobsled.**

**bobtail** (bob′tāl′), *n.* (١) کلکی بڕاو یا کورتکراوە (ئەسپ، سەگ).
(٢) ئەسپ‌و سەگی کلك بڕاو یا کورتکراوە.

*adj.* (١) کلك بڕاو؛ کلك کورتکراوە. (٢) کورتکراوە.

*v.t.* (١) کلك بڕین یا کورتکردنەوە (ئەسپ، سەگ).
(٢) کورتکردنەوە.

**bobwhite** (bob′hwīt′), *n.* قەتێ.

**bocaccio** (bə-kä′chō), *n.* ماسی‌یەکی دەم زلی کالیفۆرنیایی‌یە.

**bock** (bok), *n. Also* **bock beer,** بیرەیەکی ڕەشباوە لە بەهاردا دروست دەکرێت.

**bode** (bōd), *v.t.* نیشانەی دواڕۆژبوون (باش یا خراپ).

**bode ill,** نیشانەیەکی خراپە بۆ دواڕۆژ؛ باش نەگەیاندن بۆ دواڕۆژ:
*( His idle habits bode ill for his future.)*

**bode well,** نیشانەیەکی باشە بۆ دواڕۆژ؛ خێر پێوەبوون:
*( The rain bodes well for farmers.)*
**bode** (bōd), *alternative past tense of* **bide.**
**bodice** (bod′is), ***n.*** (١) بەشی لە ناوقەد بەرەوژووری کراسی ئافرەت.
(٢) سوخمەی ژنانە.
**bodied** (bod′id), ***adj.*** (١) تەندار؛ لەشدار؛ شێوەدار.
(٢) لەشێکی تایبەتی هەیە: ***( able- ~ ; strong- ~ )*** .
**bodiless** (bod′i-lis), ***adj.*** (١) بێ لەش.
(٢) دەستی لێ گیر نابێت؛ نەبینراو.
**-bodilessness** ***(n.).***
**bodily** (bod′′l-i), ***adj.*** (١) بە لەش کراو (نەك بە مێشك)؛ لەشی:
***( ~ functions)***
(٢) تایبەتی بە لەش
***adv.*** (١) خۆی؛ کەسەکە خۆی: ***( He is ~ present.)*** .
(٢) هەمووی؛ گشتی بە یەك پارچە.
(٣) بە کۆمەڵ؛ هەموو پێکەوە.
**boding** (bō′diŋ), ***n.*** نیشانەیەکی باش یا خراپی دواڕۆژە.
***adj.*** بەدووم؛ نوقلانەی خراپ لێدەر.
**bodkin** (bod′kin), ***n.*** (١) درەوشە؛ سووژن.
(٢) تەوقەیەکی درێژی جوانی سەرە. (٣) شیشی چنین.
(٤) ئامێرێکی وەك درەوشەیە تیپی پێ بەرز دەکرێتەوە بۆ هەڵە چاك کردن
(چاپەمەنی). (٥) [Obs.]، خەنجەر.
**body** (bod′i), ***n.*** (١) تەن؛ لەش (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).
(٢) لەشی مرۆڤ لە پشتێن بەرەوژوور بەبێ قۆڵەکان؛ قەد (مرۆڤ، گیاندار)؛
بالا. (٣) قەد (ڕووەك، درەخت)؛ لاسك؛ قەف.
(٤) بەشی سەرەکی ڕاپۆرت، ووتار، یا نامە (جگە لە پێشەکی و پاشکۆو
سەرووتار). (٥) بۆدی ئوتومبیل، واتە قاوغی لەشەکەی جگە لە مەکینەو
تایەکانی (٦) ئەو بەشەی جل‌وبەرگ کە لەش دادەپۆشێت جگە لە قۆڵەکان
یا تەنها لە پشتێن بەرەوژوور جگە لە قۆڵەکان. (٧) لاشە؛ لاشەی مردوو.
(٨) بڕ؛ هەند؛ بەشێکی سەربەخۆ: ***( a ~ of water)*** .
(٩) کۆمەڵ؛ دەستە؛ تاقم: ***( a ~ of laws ; a ~ of soldiers)*** .
(١٠) ئەنجوومەن؛ کۆڕ: ***( a legislative ~ )*** .
(١١) زۆربە؛ زۆرینە (کۆمەڵە کەس یا شت).
(١٢) خەست‌وخۆڵی؛ خەستی؛ قورسی و چاکی (مەی، شلە):
***( This wine has a lot of ~ .)***
(١٣) قایمی؛ قورسی (قوماش)؛ بەرگەگری.
(١٤) [Colloq.]، مرۆڤ؛ ئادەمیزاد.
(١٥) پتەو (ئەندازە) (١٦) قەدی تیپ (چاپەمەنی).
***v.t.*** لەش بەبەرداکردن.
**keep body and soul together,** خۆڕاگرتن لەکاتی ناخۆشی و
لێقەوماندا؛ دەربردن.
**body corporate,** کۆمپانیای هاوبەشی.
**bodyguard** (bod′i-gärd′), ***n.*** پاسەوانی کەسی.
**body politic,** گەل؛ میللەت؛ گەل‌و فەرمانڕەوایی وڵاتێك پێکەوە؛
گەلێك کە قەوارەیەکی ڕامیاری هەبێت.
**body snatcher,** کەسێکە مردوو لە گۆڕ دەردەهێنێت‌و دەیدزێت بۆ
توێکاری
**Boer** (bōr, bôr, boor), ***n.*** هاوولاتییەکی خوارووی ئەفەریقایە لە
بنەچەی هۆڵەندی.
***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە کەسانە.
**bog** (bog, bôg), ***n.*** زەلکاو؛ زۆنگ؛ زۆنگاو.
***v.t. & v.i.*** **( ~ down ),** چەقین (هەر وەك لە زۆنگاودا)؛
چەقین‌و توانای خۆ ڕزگارکردن نەبوون؛ زۆر پێوە خەریك بوون:
***( They are ~ged down in a war they can't win. ;***
***We shouldn't get ~ged down in details.)***

**bogey** (bō′gi), ***n.*** = **bogy.**
**bogeyman** (bō′gi-mən), ***n.*** = **boogieman.**
**boggle** (bog′′l), ***v.t.*** (١) سەرسووڕمان: ***( It ~s the mind.)*** .
(٢) بە ناڕێك‌وپێکی کردن (کار، شت)؛ تێکدان.
***v.i.*** (١) سەرسووڕمان. (٢) ڕاڕایی کردن؛ دوودڵی کردن.
***n.*** (١) سەرسووڕمان. (٢) ڕاڕایی؛ دوودڵی.
**boggy** (bog′i, bôg′i), ***adj.*** (١) زەلکاوی؛ زۆنگاوی.
(٢) پڕە لە زەلکاو.
**-bogginess** ***(n.).***
**bogie** (bō′gi), ***n.*** = **bogy.**
**bogie** (bō′gi), ***n.*** (١) ئەو چوارچێوەیەیە کە عەرەبانەی شەمەندەفەرو
ئوتومبیلی لەسەر ڕادەوەستێت. (٢) پێچکەی تراکتۆرو دەبابە.
(٣) [Dial.]، لۆری یا عەرەبانەی نزم.
**bogle** (bō′g′l), ***n.*** = **bogy.**
**bogus** (bō′gəs), ***adj.*** ساختە؛ قەلب (پارە)؛ درۆ: ***( ~ money)*** .
**bogwood** (bog′wood′, bôg′wood′), ***n.*** داری نەبەنووسی ڕەش.
**bogy** (bō′gi), ***n. Also*** **bogey, bogie,** (١) دەعبا؛ خێو؛ دێوودرنج.
(٢) کەسێك یا شتێکی وەك دەعبا ناشرین‌و ترسناك.
**Bohemian** (bō-hē′mi-ən), ***n.*** (١) بۆهیمی؛ هاوولاتییەکی بۆهیمیا.
(٢) زمانی بۆهیمی، چیکی، یا چیکۆسلۆڤاکی. (٣) قەرەج؛ کۆچەر.
(٤) هونەرمەندێکی بەرەڵا؛ کەسێك کە ژیانێکی بەرەڵایی دەژی.
***adj.*** (١) بۆهیمی (گەل، زمان، کلتوور).
(٢) بۆهیمی؛ ژیانی بۆهیمیانە؛ بەرەڵا.
**-Bohemianism** ***(n.).***
**bohunk** (bō′huŋk), ***n.*** [Slang], کەسێکی بە بنەچە خەڵکی
ئەورووپای ڕۆژهەڵات بەتایبەتی کرێکارێك (لەڕووی سووکییەوە).
**boil** (boil), ***v.i.*** (١) کوڵان؛ قوڵپدان؛ هاتنەکوڵ؛ هاتنەجۆش.
(٢) هەڵچوون؛ شێتگیربوون؛ زۆر تووڕەبوون. (٣) چێشت لێنان.
***v.t.*** (١) کوڵاندن؛ قوڵپ پێدان؛ جۆشدان. (٢) چێشت لێنان.
***n.*** کوڵان؛ کوڵ؛ قوڵپدان؛ جۆش:
***( to bring a thing to the ~ ; to come to the ~ )***
**boil away,** قوڵپدان؛ کوڵان.
**boil down,** (١) خەست‌وخۆڵ کردنەوە (بە کوڵاندن)؛ توندکردنەوە.
(٢) کورتکردنەوە (نووسراو).
(٣) ( to ~ )، بریتی بوون لە؛ بریتییە لە:
***( It boils down to whether you want to help or not.)***
**boil over,** (١) هەڵچوون‌و ڕژان (کوڵاندن):
***( The milk has boiled over. ; The pan boiled over.)***
(٢) هەڵچوون (تووڕەیی).
**boil** (boil), ***n.*** دوومەڵ؛ زیپکە؛ پیزۆکە (کە کێمی تێدابێت).
**boiler** (boil′ēr), ***n.*** (١) دەفری ئاو کوڵاندن (سەماوەر، کتلی، مەنجەڵ).
(٢) بەرمیلی ئاو کوڵاندن (گەرماو).
(٣) بەرمیلی هەڵم (مەکینەی هەڵم).
**boiling point,** (١) پلەی هاتنەکوڵ (ئاو و شلەی تر)؛ جۆش؛
پلەی هاتنەجۆش یا کوڵان.
(٢) [Colloq.]، پلەی شێتگیربوون؛ پلەی هەڵچوون یا زۆر تووڕەبوون.
**boisterous** (bois′tēr-əs), ***adj.*** (١) قایم (با)؛ توندوتیژ (مرۆڤ،
ووتار، ڕەووشت، با)؛ هەڵچوو (مرۆڤ، دەریا).
(٢) بەجۆش‌و ڕووخۆش؛ پڕ جۆش‌وخرۆش‌و پڕ دەنگەدەنگ (ئاهەنگ، شوێن):
***( a ~ person, party, place, etc.)***
**bola** (bō′lə), ***n. Also*** **bolas,** گوریسێکە سەرێکی سێ‌پەلییە هەرپەل
بەردێکی پێوە بەستراوەو بادەدرێت وەك قۆچەقانی و دەهاوێژرێت‌و
دەئاڵێنرێت لە لاقی ڕەشەووڵاخ‌و نێچیرەوەو پێی دەگیرێت.

**bolar** (bō′lēr), ***adj.*** قوڕەسووری؛ قوڕی.

**bolas** (bō′ləs), *n.* = bola.

**bold** (bōld), *adj.* (١) ئازا؛ بەجەرگ؛ مەرد؛ پڕکێش؛ نێر؛ چاونەترس؛ نێرانە؛ ئازایانە: *( a ~ person ; a ~ move, action, etc.)* .
(٢) بێ ڕوو؛ چاوقایم؛ بێ شەرم؛ بێ حەیا.
(٣) لێژ: *( a ~ cliff)* .
(٤) دیارو بەئاسانی خوێنراوەو سەرنج ڕاکێش (نووسین، چاپ):
*( a ~ handwriting, type, etc.)*
-**boldly** *(adv.)*.

**boldface** (bōld′fās′), *n.* تیپی تۆخ و ڕەش بۆ جیاکردنەوە (چاپەمەنی): *( The entries in this dictionary are in ~ .)* .

**bold-faced** (bōld′fāst′), *adj.* (١) بێ شەرم؛ بێ حەیا؛ چاوقایم.
(٢) بە تیپی تۆخ و ڕەش چاپ کراوە یا نووسراوە (وەك ووشە سەرەکی‌یەکانی ئەم فەرهەنگە).

**boldness** (bōld′nis), *n.* (١) ئازایەتی؛ بەجەرگی؛ پڕکێشی؛ مەردایەتی (٢) بێ شەرمی؛ چاوقایمی.
(٣) (ا) کارێك یا ووتەیەکی ئازایانەو مەردانە.
(ب) کردەوەیەکی بێ حەیاو بێ شەرمانە.

**bole** (bōl), *n.* قەدی درەخت؛ قەدی دار.

**bole** (bōl), *n.* گڵەسوور

**bolero** (bō-lâr′ō), *n.* (١) سەمایەکی ئیسپانی‌یە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە. (٣) سوخمە یا یەلەکی کراوە (ژنانەو پیاوانە).

**boletus** (bə-lē′təs), *n.* جۆرێکە لە قارچك سەرەکەی لە چەتر دەچێت (هەندێکی ژەهراوی‌یەو هەندێکی دەخورێت).

**bolide** (bō′līd, bō′lid), *n.* ئەستێرەی کشاو بەتایبەتی کە دەتەقێتەوە

**boll** (bōl), *n.* قۆزاخە (پەموو)؛ کەلوو (پەموو).

**boll weevil,** قالۆنچەی پەموو: جانەوەرێکە کرمۆکەکەی لە قۆزاخەی پەموودا هەڵدێت و دەیفەوتێنێت.

**bollworm** (bōl′wûrm′), *n.* کرمی پەموو، گەنمەشامی و تەماتە.

**bolo** (bō′lō), *n.* چەقۆیەکی زلە لە ووڵاتی فیلیپین بەکاردەهێنرێت؛ چەپەچاغ

**bologna** (bō-lô′nyä), *n.* گۆشتی توێ توێ و تام تیژی گاو گوێرەکەو بەرازە.

**bolograph** (bō′lə-graf′, bō′lə-gräf′), *n.* (١) پێوەری تۆماری گۆڕینی تینی ووزەی تیشکدار (٢) **bolometer** .

**bolometer** (bō-lom′ə-tēr), *n.* پێوەری تینی ووزەی تیشکدار.

**Bolshevik, bolshevik** (bōl′shə-vik), *n.* (١) بۆلشەڤیکی؛ ئەندامی حیزبی دیموکراتی سۆشیالیست لە ڕوسیا کە شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ی بەرپاکردو یەکێتی سۆڤیەتی دامەزراند. (٢) شیوعی؛ ئەندامێکی حیزبی شیوعی (٣) کەسێکی چەپڕەو.
*adj.* بۆلشەڤیکی؛ شیوعی.

**Bolshevism, bolshevism** (bōl′shə-viz′m), *n.* بیروباوەڕو تیۆری بۆلشەڤیکی‌یەکانی ڕوسیا؛ بۆلشەڤیکێتی.

**Bolshevist, bolshevist** (bōl′shə-vist), *n.* = Bolshevik.

**Bolshevize, bolshevize** (bōl′shə-vīz′), *v.t.* ڕاکێشانە ناو حیزبی بۆلشەڤیکەوە؛ کردن بە بۆلشەڤیك.

**bolson** (bōl′sən), *n.* دەشتێکی ڕووتەنی بە شاخ دەورەدراو.

**bolster** (bōl′stēr), *n.* (١) پشتی؛ سەرین؛ دۆشەکەلە. (٢) پاڵپشت.
*v.t.* (١) سەرین خستنەژێر؛ پشتی دانەپاڵ.
(٢) ( ~ up )، پاڵپشتی کردن؛ شت دانەبەر (بۆ نەکەوتن)؛ هەڵپەساردن؛ هەڵبڕین؛ بەرزکردنەوە؛ ڕاستکردنەوە (بە پاڵپشت):
*( to ~ up something or someone)*
(٣) ئاوناخن تێخستن (بۆ گەورەکردن یا پاڵپشت کردن).

**bolt** (bōlt), *n.* (١) تیرێکی کورتی نووك کولە بە تیروکەوان دەهاوێژرێت.
(٢) ڕووداوێکی کوتوپڕ (بەتایبەتی هی ناخۆش).
(٣) هەورەتریشقە؛ هەورەبرووسکە.
(٤) لەپڕ دەرپەڕین (بەرەو شتێك یا دوور لێی). (٥) کێلوون؛ سوورگی.
(٦) زمانەی قفڵ. (٧) برغوو. (٨) تۆپە قوماش یا کاغەز.
(٩) (ا) خۆکشانەوە (لە حیزب یا کۆمەڵەیەك). (ب) میلی تفەنگ.
*v.t.* (١) تیرهاویشتن؛ تیرتێگرتن؛ تەقاندن.
(٢) لەپڕ لە دەم دەرچوون؛ لەپڕ دەرپەڕاندن (ووتە).
(٣) هەڵ لووشین؛ بەپەلە قووتدان؛ ماشینەوە.
(٤) کێلووندان؛ داخستن بە سوورگی. (٥) لێکدان بە برغوو.
(٦) هەڵکردن (تۆپە قوماش)؛ لوولدان؛ کلافەکردن.
(٧) خۆکشاندنەوە (لە حیزب یا کۆمەڵە).
*v.i.* (١) دەرپەڕین؛ بەگوڕ دەرچوون؛ تێ تەقاندن؛ لەپڕ ڕاکردن.
(٢) هەڵتیزان (ئەسپ)؛ هەڵتووزان.
(٣) هەڵ لووشین؛ بەپەلە خواردن، خواردنەوە، یا قووتدان.
(٤) خۆکشانەوە (لە حیزب یا کۆمەڵە).
(٥) بە ناکامی تۆوکردن یا گوڵ گرتن.
*adv.* کوتوپڕ؛ لەناکاو.
**bolt from the blue,** ڕووداوێکی کوتوپڕو ناخۆش (وەك هەورەتریشقە کە لە سایەقەی سامالەوە بێت)؛ لێقەومانێکی لەناکاو.
**bolt a person in (or out),** دەرگا لێ داخستن یا لەسەر کێلووندان.
**bolt upright,** بەڕێکی (وەك تیر)؛ ڕێك.
**make a bolt for it,** تێ تەقاندن؛ بۆ دەرچوون؛ ڕاکردن (لە مەترسی).
**shoot one's bolt,** بە ئەوپەڕی تواناوە هەوڵدان.

**bolt** (bōlt), *v.t.* (١) لە بێژنگ دان؛ لە هێڵەك دان.
(٢) پاك‌وپیس کردن؛ بژاردن؛ جیاکردنەوە.

**bolter** (bōl′tēr), *n.* (١) ئەسپی پەتپچڕێن؛ ئەسپی ڕاکردوو لە دەست سوار یا خاوەنەکەی؛ ئەسپی هەڵتووزێن. (٢) خۆکێشاوە (لە حیزب یا کۆمەڵە)

**bolter** (bōl′tēr), *n.* (١) هێڵەك؛ مەکینەی ئاردبێژانەوە.
(٢) ئاردبێژەرەوە (مرۆڤ).

**bolthead** (bōlt′hed′), *n.* (١) سەری برغوو؛ سەری بزمار.
(٢) شووشەیەکی مل درێژی کیمیاگەرە کۆنەکانە.

**boltrope** (bōlt′rōp′), *n.* پەتێکە بە قەراغی بایەوانی کەشتی بایەوانەوە دەدوورێتەوە بۆ قایمی و نەدڕاندنی.

**bolus** (bō′ləs), *n.* (١) (ا) تۆپەڵ؛ کوڵۆ. (ب) پاڕووی جووراو؛ پاروو.
(٢) حەبێکی گەورە (پزیشکەوانی).

**bomb** (bom), *n.* (١) بۆمبا. (٢) ڕووداوێکی کوتوپڕی سەرسووڕمێنەری ناخۆش. (٣) دەفری گازی پەستێوراو. (٤) دەردراوی ئاگرپڕژێن.
(٥) [Slang]، ژێرکەوتنێکی تەواو؛ نشووستی.
*v.t. & v.i.* بۆمباباران کردن؛ بۆمباپیادان؛ بۆمباپیاکێشان؛ ئاگرباران کردن.

**bombard** (bom-bärd′), *v.t.* (١) بۆمباباران کردن؛ بۆردومان کردن؛ بۆمباپیادان؛ بۆمباپیاکێشان؛ ئاگرباران کردن.
(٢) داگرتنەوە یا بۆمباباران کردن بە پرسیار، پێشنیاز، یا داوا.
(٣) تیشکی ئەتۆم یا ئەلەکترۆن پیادان.
*n.* جۆرە تۆپێکی جەنگی‌ی کۆنە.

**bombardier** (bom′bēr-dêr′), *n.* (١) بۆمباهاوێژ (فڕۆکەچی)؛ بۆردومانکەر. (٢) ئەفسەری تۆپ هاوێژ؛ ئەفسەری هێزی تۆپ (سوپای ئینگلیزی). (٣) [Archaic]، تۆپچی؛ تۆپەوان.
(٤) [Archaic]، کەشتی تۆپدار یا تۆپ هاوێژ.

**bombardment** (bom-bärd′mənt), *n.* (١) بۆمباباران؛ ئاگرباران؛ بۆمباباران کردن. (٢) داگرتنەوە بە پرسیار یا پێشنیاز.

**bombardon** (bom′bēr-dən, bom-bär′dən), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی‌یە لە بابەتی زوڕنا.

**bombast** (bom′bast), *n.* (١) ئاوناخنێکی نەرم‌ونۆڵ.
(٢) فشە؛ فشەفش؛ قسەی زل و هیچ‌وپووچ؛ خۆهەڵکێشان.

**bombastic** (bom-bas′tik), *adj.* پڕ لە فشەو خۆهەڵکێشان؛ فشە؛ فشەفش: *( ~ language ; a ~ speech)* .

-**bombastically** *(adv.)*.

**bomb bay,** خانەی بۆمبا لە فڕۆکەی بۆمباهاوێژدا.

**bomber** (bom'ẽr), ***n.*** (١) فڕۆکەی بۆمباهاوێژ؛ بۆمباهاوێژ؛ فڕۆکەی بۆردومانکەر. (٢) بۆمباهاوێژ (فڕۆکەچی)؛ بۆردومانکەر.

**bombing run,** بەسەردا فڕین بۆ بۆمبابارانکردن.

**bombproof** (bom'prōōf'), ***adj.*** بۆمبا کاری تێ ناکات؛ بۆمبا کارتێنەکەر.

**bomb rack,** چوارچێوەی بۆمبا هەڵگرتن (لە فڕۆکەی بۆمباهاوێژدا).

**bombshell** (bom'shel'), ***n.*** (١) بۆمبا. (٢) ڕووداوێکی لەناکاو و سەرسووڕمێنەر (بەتایبەتی هی ناخۆش).

**bomb sight,** ئامێری نیشان گرتنەوە (بۆمباهاوێژ).

**bonafide** (bō'nə-fī'di, bō'nə-fīd'), [L.], بێ ساختەو فێڵ و تەڵەکەو درۆ؛ ڕاست؛ ڕاستەقینە: ***( a ~ offer to buy the house)*** .

**bonanza** (bō-nan'zə), ***n.*** (١) کانگە؛ کانێکی پڕ؛ کانە زێڕ. (٢) [Colloq.]، بۆماتێکی زۆرباش؛ خێروبێرێکی زۆر؛ بەختەوەری.

**Bonapartism** (bō'nə-pär'tiz'm), ***n.*** (١) لایەنگری بیروباوەڕو فەرمانڕەوایی ناپلیۆن بۆناپارت. (٢) بیروباوەڕو ڕێبازی فەرمانڕەوایییەکی زۆردار یا دیکتاتۆر.

-**Bonapartist** *(n.)*.

**bonbon** (bon'bon'), ***n.*** جۆرێکە لە نوقڵ (گەلێك جار ناوەکەی شیلەی تێدایە).

**bond** (bond), ***n.*** (١) بەند؛ پەیوەند؛ پەیوەست؛ بەستەر؛ پێبەست. (٢) (*pl.*)، پێوەند. (٣) بەندیتی؛ خرانە بەندیخانەوە؛ دەستبەسەری. (٤) پەیوەندی (پەیمان، خۆشەویستی). (٥) پەیمان؛ ڕێککەوتن. (٦) پێویستی سەرشان؛ ئەرکی سەرشان. (٧) لکێنەر؛ پێوەنووسێنەر؛ پێوەبەست (گەمەن، جەوی، قەڵایی، زنجیر). (٨) کاغەزی قایم. (٩) پێوەلکێنەری ئەتۆم. (١٠) گلدانەوەی شتومەکی لە دەرەوە هێنراو لە گومرگدا هەتا باجی گومرگی لەسەر دەدرێت. (١١) قەواڵەی دارایی. (١٢) (ا) دەستەبەری (ب) دەستەبەر؛ کەفیل. (ج) بارمتە (بۆ دەستەبەری). (١٣) تێهەڵکێشانی خشت یا خشت و دار بۆ قایمی (خانووسازی).

***v.t.*** (١) پێوەلکاندن؛ پێوەنووساندن؛ لێکدان؛ بەتوندی پێکەوەبەستن یا لەحیم کردن؛ یەك پێگرتن و کردن بە یەك پارچە. (٢) بەستنەوە؛ کەلەپچەکردن. (٣) دەستەبەری کردن. (٤) گلدانەوە یا دەست بەسەردا گرتنی شتومەك لە گومرگدا هەتا باجی گومرگی لەسەر دەدرێت. (٥) خستنە ڕەهنەوە؛ دانان بە بارمتە. (٦) دەرکردنی بروانامەی دارایی و فرۆشتنی. (٧) تێهەڵکێشانی خشت یا خشت و دار بۆ قایمی (خانووسازی).

***v.i.*** یەککرتن؛ بوون بە یەك پارچە؛ بوون بە یەك.

-**bondable** *(adj.)*.

**bond** (bond), ***n.*** [Obs.], بەند؛ کۆیلە

***adj.*** بەندکراو؛ بەند؛ دەستبەسەر.

**bondage** (bon'dij), ***n.*** (١) بەندایەتی؛ بەندیتی؛ بەندەگی. (٢) دەستبەسەری؛ ژێردەستێتی؛ ملکەچی.

**bonded** (bon'did), ***adj.*** (١) بارمتەی هەیە؛ بارمتەی بۆ دانراوە. (٢) گلدراوەتەوە یا دەستی بەسەردا گیراوە لە گومرگ هەتا باجی گومرگی لەسەر دەدرێت ***( ~ merchandise)*** .

**bonded warehouse,** عەماری گومرگ (کە شتی تێدا گل دەدرێتەوە هەتا باجی گومرگی لەسەر دەدرێت).

**bondholder** (bond'hōl'dẽr), ***n.*** قەواڵەدار؛ خاوەن قەواڵەی دارایی.

**bondmaid** (bond'mād'), ***n.*** کەنیزەك؛ بەندەکارەکەر (کچ، ژن).

**bondman** (bond'mən), ***n.*** (١) مسکێن (٢) [Archaic]، بەند؛ کۆیلە.

**bond paper,** جۆرێکە لە کاغەزی سپی نایاب.

**bond-servant** (bond'sũr'vənt), ***n.*** ***Also*** bond servant, (١) نۆکەری بێگارکەر. (٢) بەند؛ کۆیلە.

**bondsman** (bondz'mən, bonz'mən), ***n.*** (١) **bondman** . (٢) دەستەبەر؛ کەفیل.

**bondwoman** (bond'woom'ən), ***n.*** ژنەبەند؛ کەنیزەك.

**bone** (bōn), ***n.*** (١) ئێسقان؛ ئێسك. (٢) (*pl.*)، ئێسك؛ ئێسکەبەند؛ چوارچێوەی لەش. (٣) (*pl.*)، لەش؛ لاشە. (٤) ماددەیەکی وەك ئێسقان. (٥) شتی لە ئێسقان دروستکراو. (٦) (*pl.*)، [Colloq.]، زار (تاولە، دۆمینە). (٧) [Slang]، قوتابی کۆششکەر.

***v.t.*** (١) ئێسقان لێکردنەوە: ***( to ~ a chicken, fish, etc.)*** . (٢) جلوبەرگ ڕەق کردن (بە ئێسقانی نەهەنگ). (٣) زەوی بەهێزکردن (بە ئێسقانی سووتاو).

***v.i.*** [Slang], **( ~ up ),** زۆر کۆشش کردن (قوتابی).

**feel in one's bones,** وا هەستکردن؛ دڵنیابوون بەبێ بوونی بەڵگەیەك.

**have a bone to pick with (someone),** بەڵگەهەبوون بۆ دەمەقاڵێ، شەڕ، یا سکاڵاکردن.

**make no bones about,** [Colloq.], لاری لێ نەبوون؛ نەشاردنەوە؛ بە ئاشکرا دان پیانان؛ پێ شەرم نەبوون.

**to the bone,** بەتەواوی؛ تەواو؛ یەکجار.

**bone ash,** خۆڵەمێشی ئێسقان.

**boneblack** (bōn'blak'), ***n.*** ***Also*** **bone black,** بۆیەی ڕەشی ئێسقان (لە سووتاندنی ئێسقان لەجێگەی هەوابڕدا پەیدا دەبێت).

**bone china,** کاشی دروستکراو لە گڵ و خۆڵەمێشی ئێسقان.

**boned** (bōnd), ***adj.*** (١) خاوەن جۆرە ئێسقانێکی تایبەتی: ***( brittle- ~ )*** (٢) ئێسقان لێ دەرهێنراو: ***( a ~ chicken)*** . (٣) پارچە ئێسقانی نەهەنگ تێخراو.

**bonedry** (bōn'drī'), ***adj.*** ووشك و برنگ؛ زۆر ووشك.

**bonehead** (bōn'hed'), ***n.*** [Slang], کەسێکی بێ مێشك.

**boneless** (bōn'lis), ***adj.*** بێ ئێسقان؛ ئێسقان لێ دەرهێنراو.

**bone meal,** ئاردی ئێسقان (بۆ خۆراکی ئاژەڵ و زەوی بەهێزکردن)؛ ئێسقانی هاڕراو.

**bone of contention,** هۆی ناکۆکی یا مشتومڕ.

**boner** (bōn'ẽr), ***n.*** [Slang], هەڵەیەکی خراپ؛ هەڵەیەکی گەرانە.

**boneset** (bōn'set'), ***n.*** ڕووەکێکە لە دەرمانی ئارەق کردنەوەو دەرمانی بەهێزیدا بەکاردێت.

**bonesetter** (bōn'set'ẽr), ***n.*** ئێسقانی شکاو لەجێ چوو گرەوە.

**bonfire** (bon'fīr'), ***n.*** ئاگرەخۆشە.

**bongo drums,** جووتە تەپڵی پێکەوەبەستراوی بە دەست لێدراو.

**bonhomie, bonhommie** (bon'ə-mē'), ***n.*** ڕووخۆشی؛ ئاسکی ڕەووشت.

**boniface** (bon'ə-fās'), ***n.*** خاوەن چێشتخانە، میوانخانە، یا یانەی شەو.

**bonito** (bə-nē'tō), ***n.*** جۆرە ماسییەکی دەریایییە.

**bonnet** (bon'it), ***n.*** (١) کڵاوی بێ قەراغ (بەتایبەتی ئوسکوتلەندی). (٢) کڵاوێکی فشەڵی ژن و منداڵە بە شریتێکی ژێر چەناگە قایم دەکرێت (٣) کڵاوی پەڕاوی (هی هیندییە ئەمەریکاییەکان). (٤) کڵاوە یا بۆنێتی ئوتومبیل. (٥) کڵاوی سەر لوولەی زۆپا. (٦) [Colloq.]، هەموو جۆرە کڵاو یا شەپقەیەکی ژنانە. (٧) پارچەیەك جانفاسە لە دامێنی بایەوانی کەشتی با دەدرێت.

***v.t.*** کڵاو لەسەرکردن؛ کڵاو کردنە سەر؛ داپۆشین بە شتێکی وەك کڵاو.

**bonny, bonnie** (bon'i), ***adj.*** (١) جوان؛ شۆخ؛ قۆز. (٢) تەندرووست؛ بەهێز و تەندرووست و چاك. (٣) ڕووخۆش. (٤) باش؛ چاك.

-**bonnily** *(adv.)*; **bonniness** *(n.)*.

**bontebok** (bon′tə-bok′), *n.* ئاسكێكی خواروی ئەفەریقایە پەڵەی سپی بە ناوچەوان و کەفەڵی‌یەوەیەتی.
**bonus** (bō′nus), *n.* (١) بەخشیش؛ زیادە بەخشیش.
(٢) دەسکەوت یا قازانجی زیادە.
(٣) ئەو مزەیە کە کۆمپانیایەك دەیدات بە میری بۆ پاس پێدانی.
(٤) بەخشیشی دراو بە ئەفسەرو سەربازی خانەنشین کراو.
**bony** (bōn′i), *adj.* (١) ئێسقانی؛ لە ئێسقان چوو؛ وەك ئێسقان.
(٢) ئێسقاناوی؛ ئێسقان زۆر.
(٣) ئێسقان بەدەرەوە؛ ئێسقان گەورەو دیار.
(٤) ڕەقەڵە؛ لەڕ؛ پووکاوە.
**-boniness** *(n.).*
**bonze** (bonz), *n.* قەلەندەرێکی بوودی یابانی یا چینی.
**boo** (bōō), *interj. & n.* هووها.
*v.i.* هووهاکێشان.
*v.t.* هووها لێ کێشان؛ فیکە بۆ لێدان.
**boob** (bōōb), *n.* [Slang], کەسێکی بێ مێشکی کەر؛ کەسێکی ساوێلکەی بێ ئاگا.
**boob** (bōōb), *n.* [Slang], مەمك.
**booboo** (bōō′bōō), *n.* هەڵەیەکی کەرانە
**booby** (bōō′bi), *n.* (١) کەسێکی بێ مێشك یا کەودەن.
(٢) [Vulgar]، مەمك. (٣) کەڕەواڵە؛ باڵندەیەکی دەریایی گەورەیە چاوەکانی لە نزیك بن دەنووکی‌یەوەیەتی. (٤) قەڵبترین یاریکەری ملەملانێیەك.
**booby hatch,** (١) دەرگای عەماری کەشتی.
(٢) شێتخانە؛ نەخۆشخانەی شێتان.
**booby prize,** بەخشیشێکی هیچ‌وپووچ لەڕووی گاڵتەوە دەدرێت بە قەڵبترین یاریکەری ملەملانێیەك.
**booby trap,** (١) داو؛ تەڵە؛ تەڵەی بێ ئاگایان.
(٢) مین یا تەقەمەنی‌یەکە وەك تەڵە دەنرێتەوە بۆ کەسانی بێ ئاگا کە بە خۆیاندا دەیتەقێننەوە.
**boodle** (bōō′d'l), *n.* [Slang], (١) جەماوەر؛ کۆمەڵە خەڵك.
(٢) پارەی قەڵب. (٣) بەرتیل.
(٤) تالانی: شتی دزراو.
**boohoo** (bōō′hōō′), *v.i.* بە کوڵ گریان؛ بە دەنگی بەرز گریان.
*n.* گریانی بە کوڵ.
**book** (book), *n.* (١) پەڕتووك؛ کتێب. (٢) پەڕاو؛ دەفتەر.
(٣) بەرگ (پەڕتووك، داستان)؛ بەش.
(٤) پەڕاوی بێ هێڵ، هێڵدار، یا ئیستیمارە: *( an account ~ )*.
(٥) تۆماری ژمێریاریی.
(٦) باسێك کە بۆ لێکۆڵینەوە بشێت: *( the ~ of life)*.
(٧) بەستە (تکت، پوول)؛ پاکەت: *( a ~ of stamps, tickets, etc.)*.
(٨) کۆمەڵێك پەیڕەوو دەستوور: *( He runs the company by the ~ .)*.
(٩) لیستەی گرەو (پێشبڕکێی ئەسپ).
(١٠) پێڕ (یاری کاغەزی " بریج ").
*v.t.* (١) نووسین؛ تۆمارکردن؛ لیستەکردن.
(٢) پێشەکی جێگەگرتن؛ قۆرخ کردن: *( to ~ tickets, seats, etc.)*.
(٣) پێشەکی گرتن: *( to ~ a speaker, entertainer, etc.)*.
(٤) تۆمارکردنی تاوانی گومانبارێك لەلایەن پۆلیسەوە.
*adj.* بەگوێرەی پەڕتووك؛ لە پەڕتووکدا.
**bring to book,** (١) لێپرسینەوە؛ بەرپرسیارکردن.
(٢) سەرزەنشت کردن.
**by the book,** بەگوێرەی پەیڕەوو دەستوور؛ بەبێ لادان لە پەیڕەو: *( to do something by the book)*
**close the books,** (١) حساب داخستن.
(٢) دوایی پێ هێنان: *( We closed the books on that subject.)*.
**in one's book,** لە ڕای کەسێکدا؛ بە ڕای ئەو: *( In my book, she is a worthless woman.)*
**keep books,** حساب ڕاگرتن؛ تۆمارکردن و ڕاگرتنی حسابات.
**know like a book,** زۆر باش ناسین؛ شارەزابوون.
**on the books,** (١) تۆمارکراو. (٢) لیستەگیراو.
**the Book,** ئینجیل.
**the book,** [Colloq.], کۆمەڵە بیروباوەڕو پەیڕەوێکی باوەڕپێکراو.
**bookbinder** (book′bīn′dēr), *n.* بەرگ تێگری پەڕتووك؛ شیرازەبەند.
**bookbindery** (book′bīn′dēr-i), *n.* کارگەی شیرازەبەندی؛ کارگەی بەرگ تێگرتنی پەڕتووك.
**bookcase** (book′kās′), *n.* دۆڵاب یا ڕەفەی پەڕتووك.
**book club,** (١) پەڕتووکگای ئەندامان.
(٢) یانەی پەڕتووکی ئەندامان: یانەیەکە پەڕتووك بە هەرزان دەفرۆشێت بەو کەسانەی هەرساڵە ژمارەیەکی تایبەتی پەڕتووك دەکڕن.
**book end,** پاڵپشتی پەڕتووك (کە دەدرێتە پاڵ ئەمسەرو ئەوسەری ڕیزە پەڕتووکی سەر ڕەفەیەك).
**bookie** (book′i), *n.* [Slang], دەڵاڵی گرەو (پێشبڕکێی ئەسپ).
**booking** (book′iŋ), *n.* بە کرێ گرتن و قۆرخ کردنی مرۆڤ (بۆ دووان، خۆنوواندن... هتد).
**bookish** (book′ish), *adj.* (١) تایبەتی بە پەڕتووك.
(٢) زۆر حەزکەر لە پەڕتووك خوێندنەوە.
(٣) تەنها شتی ناو پەڕتووك زان؛ لە شتی ناو پەڕتووك زیاتر هیچ نەزان.
(٤) ووشك (مرۆڤ).
**book jacket,** چاکەتی پەڕتووك (کە بە بەر بەرگی پەڕتووکەوەیەو ڕەنگاوڕەنگەو دەتوانرێت لێی بکرێتەوە).
**bookkeeper** (book′kēp′ēr), *n.* دەفتەرگر؛ دەفتەردار.
**bookkeeping** (book′kēp′iŋ), *n.* دەفتەرگری؛ دەفتەرگرتن؛ دەفتەرداری.
**book learning,** زانین و شارەزایی لە پەڕتووکەوە وەرگیراو نەك لە ئەزموونی ژیانەوە.
**-book-learned** *(adj.).*
**booklet** (book′lit), *n.* نامیلکە؛ پەڕتووکی بچووك.
**booklore** (book′lôr′, book′lōr′), *n.* = **book learning.**
**book louse,** جانەوەری پەڕتووك و کاغەز خۆر.
**bookmaker** (book′māk′ēr), *n.* (١) پەڕتووك بژارکەر، لەچاپدەر، بڵاوکەرەوە، یا بەرگ تێگر. (٢) دەڵاڵی گرەو (پێشبڕکێی ئەسپ).
**bookman** (book′mən), *n.* (١) پەڕتووك خوێنەرەوە؛ قوتابی؛ زانا.
(٢) پەڕتووك فرۆش.
**bookmark** (book′märk′), *n.* پەڕتووك نیشانەکەر: هەرشتێك کە بخرێتە نێوان دوو پەڕەوە بۆ نیشانەکردن.
**book matches,** قوتووە شقارتە.
**bookmobile** (book′mə-bēl′), *n.* پەڕتووکخانەی گەڕۆك.
**bookplate** (book′plāt′), *n.* یافتە یا پارچە کاغەزێکە ناوونیشانی خاوەن پەڕتووکی لەسەر دەنووسرێت و دەنرێت بە دیوی ناوەوەی پەڕتووکەکەوە.
**bookrack** (book′rak′), *n.* (١) ڕەفەی پەڕتووك.
(٢) چوارچێوەی پەڕتووك (بۆ لەسەر دانانی بەکراوەیی و خوێندنەوەی).
**book review,** پەڕتووك هەڵسەنگاندن؛ پەڕتووك شەنوکەوکردن.
**bookseller** (book′sel′ēr), *n.* پەڕتووك فرۆش.
**bookshelf** (book′shelf′), *n.* ڕەفەی پەڕتووك.
**bookstack** (book′stak′), *n.* دەستە ڕەفەی پەڕتووك (پەڕتووکخانە).
**bookstall** (book′stôl′), *n.* فرۆشگای پەڕتووك (لەسەر شەقام و ئێستگەی شەمەندەفەردا)؛ قەفەزی پەڕتووك فرۆشتن.
**bookstand** (book′stand′), *n.* (١) **bookstall** .
(٢) **bookrack** .

**bookstore** (book′stôr′, book′stōr′), *n.* فرۆشگای پەڕتووك؛ فرۆشگای پەڕتووك‌و شتوومەكی نووسین.
**book value,** نرخ بەپێی دەفتەری حسابات (بەتایبەتی هی دەزگایەكی بازرگانی كە لەوانەیە جیابێت لە نرخی ڕاستەقینەی).
**bookwork** (book′wûrk′), *n.* پەڕتووك خوێندنەوەو كۆشش كردن؛ خوێندنەوەو هەوڵدان.
**bookworm** (book′wûrm′), *n.* (١) مۆرانەی پەڕتووك.
(٢) خوێنەری لە ڕادە بەدەر؛ كەسێك كە زۆر دەخوێنێتەوە.
**boom** (bōōm), *v.i.* دەنگدانەوە (تۆپ، تفەنگ)؛ گرمەهاتن.
*v.t.* لێدان؛ پیشاندان بە دەنگ: *( The clock ~ed the hour.)* .
*n.* (١) گرمە (تۆپ، هەورەتریشقە). (٢) دەنگی خوێندنی هەندێك گیاندار (بۆق).
**boom** (bōōm), *n.* (١) ستوونی بایەوانی كەشتی با.
(٢) باڵی ئامێری بەرزكەرەوە. (٣) (ا) بەستی سەر ڕووبارێك بۆ كۆكردنەوەی دارو دەستەك لەكاتی گواستنەوەیدا بە ڕووبارەكەدا. (ب) مۆڵگەی ئەم دارو دەستەكە.
*v.t.* بایەوان كردنەوە.
*v.i.* (١) بەلەم لێخوڕین بە كردنەوەی بایەوانەكانی بەتەواوی.
(٢) ( ~ along )، خێرا ڕۆیشتنی كەشتی با.
(٣) خێرا ڕۆیشتن؛ بە گورج‌وگۆڵی ڕۆیشتن.
**boom** (bōōm), *v.i.* پەرەسەندن؛ گەشەكردن؛ برەو سەندن:
*( Business ~ed.)*
*v.t.* (١) پەرە پێ سەندن؛ برەو پێ سەندن؛ گەشەپێكردن:
*( The war ~ed the aircraft industry.)*
(٢) پاڵپشتی كردن؛ پشتگیری كردن؛ برەوپێدان:
*( They ~ed him for mayor.)*
*n.* پەرەسەندنی بازرگانی‌و كارو كاسبی‌و باری ژیان؛ سەردەمێكی وەها.
*adj.* تایبەتی بە پەرەسەندنی بازرگانی‌و كارو كاسبی.
**boomerang** (bōōm′ēr-aŋ), *n.* (١) دارێكی چەماوەیە كاتێك كە دەهاوێژرێت دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو كەسەی كە هاویشتوویەتی (هاوڵاتی‌یە سەرەتایی‌یەكانی ئوستورالیا وەك چەك بەكاری دەهێنن).
(٢) كردەوەیەكە كە بە زیان دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكەی.
*v.i.* . *( His criticisms ~ed.)* بە زیان گەڕانەوە بۆ ئەوەی بەكاری دەهێنێت:
**boon** (bōōn), *n.* (١) بەهرە؛ خێروبەرەكەت؛ بەخشیش.
(٢) [Archaic]، خواست؛ داوا؛ تكا؛ داخوازی.
**boon** (bōōn), *adj.* (١) [Archaic & Poetic]، بەخشندە؛ دڵنەرم؛ دەست‌ودڵ تێر (٢) ڕووخۆش؛ دەم بە پێكەنین: *( a ~ companion)* .
**boondocks** (bōōn′doks′), *n.pl.* (١) چڕستان؛ بێشەلان.
(٢) شوێنی دوور لە ئاوایی؛ شوێنی چەپە؛ دەشت‌ودەر؛ لادێ.
**boondoggle** (bōōn′dôg′l, bōōn′dog′l), *v.i.* كات بەفیڕۆدان بە كاری هیچ‌وپووچەوە.
*n.* كاری هیچ‌وپووچ؛ ئیشی بێ بایەخ.
**boor** (boor), *n.* (١) مسكێن؛ وەرزێر؛ كشتكار؛ لادێیی.
(٢) كەسێكی نەزان‌و قسەڕەق‌و بێ نەزاكەت؛ كەسێكی كەرتڕ.
**boorish** (boor′ish), *adj.* بێ نەزاكەت؛ كەرتڕ؛ قسەڕەق؛ نەزان.
**boost** (bōōst), *v.t.* [Colloq.], (١) بەرزكردنەوە؛ هەڵبڕین.
(٢) زیادكردن؛ بەرزكردنەوە (نرخ): *( They ~ed prices.)* .
(٣) زیادكردن (تەووژمی كارەبا).
(٤) برەوپێدان (مرۆڤ، نەخشە، شت)؛ پاڵپشتی كردن؛ بووژاندنەوە؛ سەرخستن:
*( to ~ a person, a plan, the economy, etc.)*
*n.* [Colloq.], (١) پاڵ؛ پاڵ پێوەنان؛ بەرزكردنەوە؛ هەڵبڕین.
(٢) زیادە؛ زیادكردن: *( a ~ in prices)* .
(٣) یارمەتی؛ پشتگیری؛ هاندان؛ بووژانەوە:
*( She needed a ~ . ; Your support has given me a big ~ .)*
**booster** (bōōs′tēr), *n.* [Colloq.], (١) پشتگیریكەر؛ یارمەتیدەر.
(٢) ئامێری بەهێزكردن. (٣) دەنگ گەورەكەر (رادیۆ).
(٤) ئامێری بەهێزكردن‌و چاك كردنی وەرگرتنی بەرنامەی تەلەفزیۆن.
(٥) ئامێری بەهێزكردن یا هاویشتنی كەشتی ئاسمانی.
(٦) كوتان یا دەرزی دووەم (بۆ بەرهەڵستی نەخۆشی).
**booster cable,** = jumper cable.
**booster shot,** كوتان یا دەرزی دووەم (بۆ بەرهەڵستی نەخۆشی).
**boot** (bōōt), *n.* (١) جزمە؛ چەكمە؛ پۆستاڵ؛ پێڵاو.
(٢) سنووقی ئوتومبیل (بۆ شت هەڵگرتن).
(٣) ئامێری ئازاردان (لە شێوەی جزمەدایە بۆ گووشینی پێ).
(٤) سەرجلی پارێزەر (بۆ لێخوڕی ئوتومبیلی سەربەتاڵ).
(٥) شەق؛ لەقە.
(٦) [Slang]، سەربازی تازەگیراو (هێزی دەریایی).
*v.t.* (١) جزمە لەپێكردن؛ پێڵاو لەپێكردن.
(٢) ئازاردان بە ئامێرێكی وەك جزمە.
(٣) [Slang]، دەركردن (لە كار یا شوێنێك).
**bet your boots,** بێ گومان؛ مسۆگەرە.
**get the boot,** دەركران (لە كار).
**give (someone) the boot,** دەركردن (لە كار).
**lick the boots of,** پێڵاو لستنەوە؛ قۆندەرە ماچ كردن.
**boot** (bōōt), *n., v.t. & v.i.* [Obs.], چارە؛ سوود؛ كەڵك.
**to boot,** سەرەڕای ئەوەیش؛ زیاد لەوەیش؛ جگە لەوەیش.
**bootblack** (bōōt′blak′), *n.* بۆیاخچی (پێڵاو).
**boot camp,** [Colloq.], ئۆردووگای مەشقی تازە سەرباز.
**booted** (bōōt′id), *adj.* (١) جزمەلەپێ. (٢) شەق تێهەڵدراو.
(٣) [Slang]، لە كار دەركراو؛ لێخراو.
**bootee** (bōō-tē′), *n.* (١) جزمەی كورت (هی ژن‌و منداڵ).
(٢) پێڵاوی چنراوی منداڵ.
**booth** (bōōth, bōō*th*), *n.* (١) قەفەزەیەكی كاتی‌یە بۆ شت فرۆشتن لەناو بازاڕدا یا لەسەر شەقام؛ فرۆشگایەكی بچكۆلەی كاتی؛ دووكانۆچكە.
(٢) قەفەزەی دەنگدان. (٣) (ا) قەفەزەی پاسەوان؛ ژووروچكەی پاسەوانان.
(ب) قەفەزەی تەلەفۆن‌و شتی وەهای تر. (٤) مێزێكی دەورگیراوی چێشتخانە.
**bootjack** (bōōt′jak′), *n.* جزمەداكەن (ئامێر).
**bootleg** (bōōt′leg′), *v.t. & v.i.* دروستكردن‌و فرۆشتنی عەرەق‌و مەی بە قاچاخ.
*adj.* (١) بە قاچاخ دروستكراوو فرۆشراو (عەرەق، مەی).
(٢) تایبەتی بە خواردنەوەی بە قاچاخ دروستكراوو فرۆشراو.
*n.* مەی‌و خواردنەوەی تری بە قاچاخ دروستكراوو فرۆشراو.
**bootlegger** (bōōt′leg′ēr), *n.* قاچاخچی خواردنەوەی سەرخۆشكەر؛ دروستكەرو فرۆشیاری عەرەق بە قاچاخ.
**bootless** (bōōt′lis), *adj.* بێ كەڵك؛ بێ سوود.
**bootlick** (bōōt′lik′), *v.t. & v.i.* [Slang], پێڵاو لستنەوە یا ماچ كردن؛ مەرایی كردن.
-bootlicker *(n.).*
**boots** (bōōts), *n.* [British], بەردەستی میوانخانە (بەتایبەتی بۆیاخچی پێڵاو).
**boot tree,** قالبی پێڵاو (بۆ ڕاگرتن یا ڕاستكردنەوەی).
**booty** (bōō′ti), *n.* (١) تالانی جەنگ.
(٢) تالانی؛ شتی دزراو یا سەندراو.
(٣) دەسكەوتێكی بەنرخ؛ خەڵات.
**booze** (bōōz), *v.i.* [Colloq.], مەست بوون؛ زۆر خواردنەوە.
*n.* [Colloq.], (١) مەی؛ عەرەق؛ خواردنەوەی سەرخۆشكەر.
(٢) ئاهەنگی خواردنەوە.
-boozer *(n.)*; boozy *(adj.).*
**bop** (bop), *v.t.* [Slang], مستەكۆڵە لێدان؛ لێدان؛ پیاكێشان.
*n.* [Slang], مستەكۆڵە؛ لێدانێك؛ پیاكێشانێك.
**bop** (bop), *n.* جۆرێكە لە مۆسیقای " جاز " .
**boracic** (bō-ras′ik), *adj.* = boric.

**borage** (bũr′ij, bôr′ij, bor′ij), *n.* پووەکێکی گوڵ شینی گەڵا تووکنە (هەندێك جار دەکرێتە زەڵاتەوە).

**borate** (bôr′āt, bō′rāt), *n.* خوێی ترشی بۆریك.
*v.t.* خوێی ترشی بۆریك لێدان یا تێکەڵوکردن.

**borax** (bôr′aks, bō′raks), *n.* بۆراکس: ماددەیەکی سپی کریستاڵە.

**Bordeaux** (bôr-dō′), *n.* شەرابی " بۆردۆ " ی فەرەنسی.

**bordel** (bôr′d'l), *n.* = **bordello.**

**bordello** (bôr-del′ō), *n.* قەحبەخانە.

**border** (bôr′dēr), *n.* (١) سنوور. (٢) قەراغ؛ پەراوێز؛ لا.
(٣) تیرەیەکی باریکی گوڵدانە بە قەراغ باخچەیەك یا ڕاڕەوێکدا.
*v.t.* (١) سنوور بۆ دانان؛ سنوور بۆ کردن. (٢) دەورەدان؛ بوون بە سنوور بۆی.
*adj.* تایبەتی بە سنوور؛ هی نزیك سنوور؛ هی سنوور.
**border on (or upon),** (١) هاوسنووربوون؛ بەتەنیشتەوەبوون:
*( My land borders on yours.)*
(٢) لێکچوون؛ لێککردن؛ وەك یەك وابوون:
*( an act that borders on heroism, insanity, etc.)*

**borderer** (bôr′dēr-ēr), *n.* سنوورنشین.

**borderland** (bôr′dēr-land′), *n.* (١) زەوی سەر سنوور؛ سنوور؛ زەوی سنوور. (٢) بارێك یا جێگەیەکی نەبڕاوە یا بەلایەکدا نەکەوتوو.

**borderline** (bôr′dēr-līn′), *n. Also* **border line,** سنوور.
*adj.* (١) لەسەر سنوور؛ سەرسنووری.
(٢) نەبڕاوە؛ بەلایەکدا نەکەوتوو؛ لەنێوان دوو شت، بار، یا پلەدایە:
*( a ~ grade, student, etc.)*

**bore** (bôr, bōr), *v.t.* (١) کون کردن (بە درەوشە)؛ سمین.
(٢) هەڵکەندن و کون تێکردن (کون، تونێل)؛ بڕین.
(٣) خۆکردن بەناو جەماوەرێکدا؛ دڕ بە جەماوەرێك دان و ڕێگە بۆ خۆ کردنەوە.
*v.i.* (١) کونکردن؛ کون تێکردن؛ کوناودەرکردن.
(٢) کون کران؛ کون تێکران؛ کون بوون. (٣) بەرەو پێشەوە چوون.
*n.* (١) کون (کە بە درەوشەو شتی وەها بکرێت). (٢) کون (بۆری، لوولە، تفەنگ).
(٣) تیرەی کونە لوولەیەکی وەها. (٤) ئامێری کونکەر (درەوشە).

**bore** (bôr, bōr), *v.t.* بێ تاقەت کردن (لەبەر ووشکی و ناخۆشی و یەك ئاوازی و قسەی بێ تام): *( He ~s me. ; His stories ~ me.)*.
*n.* کەسێك یا شتێکی بێ تاقەت کەر (لەبەر ووشکی و ناخۆشی و یەك ئاوازی و قسەی بێ تام): *( He is a ~ .)*.

**bore** (bôr, bōr), *n.* شەپۆلێکی زل بەهێز (لە ڕووبارو زێدا).

**bore** (bôr, bōr), *past tense of* **bear.**

**boreal** (bôr′i-əl, bō′ri-əl), *adj.* (١) باکووری.
(٢) تایبەتی بە بای باکوور.

**Boreas** (bôr′i-əs, bō′ri-əs), *n.* (١) خودای بای باکوور (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) بای باکوور.

**boredom** (bôr′dəm, bōr′dəm), *n.* بێ تاقەتی (بەهۆی بێکاری یا ووشکی و ناخۆشی کاروباری ژیانەوە).

**borer** (bôr′ēr, bōr′ēr), *n.* (١) ئامێری کونکەر.
(٢) کرمی کونکەرە میوەوە.

**boric acid,** ترشی بۆریك.

**boring** (bôr′iŋ, bōr′iŋ), *n.* (١) کونکردن (وەك بە درەوشە).
(٢) کون (کە بەم جۆرە بکرێت). (٣) (*pl.*)، تەراش و ئاردەمشارو تەڵەزم کە لە دارو دیوار کونکردنەوە پەیدا دەبێت.

**boring** (bôr′iŋ, bōr′iŋ), *adj.* ووشك؛ ناخۆش؛ بێ تاقەت کەر (شت، شوێن، مرۆڤ): *( a ~ person, class, lecture, film, place, etc.)*.

**born** (bôrn), *past participle of* **bear.**
*adj.* (١) لەدایکبوو.
(٢) زگماکی؛ بە زگماکی: *( a ~ artist, leader, writer, etc.)*.

**borne** (bôrn), *past participle of* **bear.,** هەڵگرتن.

**boron** (bô′ron, bō′ron), *n.* بۆرۆن: توخمێکی کیمیایی ناکانزاییە.

**borough** (bũr′ō), *n.* (١) شارێکی سەربەخۆی ئەمەریکا.
(٢) کەرەکێکی شاری " نیویۆرك " ؛ کەرەك.
(٣) (ا) شارێکی سەربەخۆی ئینگلتەرە.
(ب) شارێکە کە نوێنەرێك یا زیاتر دەنێرێت بۆ پەرلەمانی ئینگلتەرە.

**borrow** (bor′ō, bôr′ō), *v.t. & v.i.* (١) خواستن؛ قەرزکردن؛ بە ئەمانەت وەرگرتن:
*( May I ~ your dictionary? ;*
*I ~ed some money from him.)*
(٢) کردن بە هی خۆ؛ لێ دزین: *( He ~ed my theory.)*.
(٣) خواستن (لێدەرکردن لە ژمێرەدا).
*n.* [Obs.], (١) دەستەبەری. (٢) دەستەبەر.
**-borrower** *(n.).*

**borsch** (bôrsh), *n.* شۆربای چەوەندەری ڕوسی.

**borscht** (bôrsht), *n.* = **borsch.**

**bort** (bôrt), *n.* ئەڵماسی بڕین؛ ئەڵماسێکی ڕەشۆکەیە.

**bortz** (bôrts), *n.* = **bort.**

**borzoi** (bôr′zoi), *n.* جۆرە سەگێکی گەورەی سەرباریکی لاق درێژی تووك نەرمە.

**boscage** (bos′kij), *n.* دارودەوەن؛ بێشە؛ چڕانی.

**bosh** (bosh), *n. & interj.* [Colloq.], بۆش؛ قسەی بۆش؛ قسەی قۆڕ.

**bosk** (bosk), *n.* = **boscage.**

**boskage** (bos′kij), *n.* = **boscage.**

**bosky** (bos′ki), *adj.* (١) دارودەوەناوی. (٢) سێبەر؛ سێبەراوی.

**bo's'n** (bō′s'n), *n.* = **boatswain.**

**bosom** (booz′əm, bōō′zəm), *n.* (١) سنگ؛ سینە. (٢) مەمك.
(٣) سینەو مەمك؛ باخەڵ. (٤) سنگی کراس و چاکەت.
(٥) ناوجەرگە: *( the ~ of one's family)*.
*v.t.* (١) باوەش کردن؛ بە سنگەوە نان؛ باوەش پیاکردن.
(٢) شاردنەوە؛ لە دڵی خۆدا شاردنەوە.
*adj.* (١) تایبەتی بە سنگ؛ سینەیی؛ سینەومەمکی.
(٢) خۆشەویست؛ گیانی بە گیانی: *( a ~ friend)*.

**boss** (bôs, bos), *n.* [Colloq.], (١) سەرکار؛ سەرگەورە؛ سەرۆك.
(٢) سەرۆکی حیزب یا کۆمەڵەیەکی ڕامیاری.
*v.t.* [Colloq.], فەرمان بەسەردا کردن؛ سەرکاری کردن.
*adj.* [Colloq.], سەرۆك؛ سەرگەورە.

**boss** (bôs, bos), *n.* (١) تەرەقە یا دوگمەی سەر قەڵغان.
(٢) چوکڵەی دەرپۆقیوی شتێکی ڕازاوە. (٣) بەشی گەورە یا فراوانی لوولەیەك.
*v.t.* بە دوگمەو تەرەقە ڕازاندنەوە.

**boss** (bos, bôs), *n.* مانگا؛ گوێرەکە.

**bossy** (bôs′i, bos′i), *adj.* حەزکەر لە فرمان بەسەرداکردن؛ بە زەبروزەنگ؛ نێرە؛ کەڵە.
**-bossily** *(adv.)*; **bosiness** *(n.).*

**bossy** (bôs′i, bos′i), *adj.* بە دوگمەو تەرەقە ڕازاوە.

**bossy** (bos′i, bôs′i), *n.* مانگا؛ گوێرەکە.

**boston** (bôs′t'n, bos′t'n), *n.* (١) جۆرێکە لە یاری کاغەز.
(٢) جۆرێکە لە سەمای " والتز " .

**Boston bull,** = **Boston terrier.**

**Boston terrier,** جۆرە سەگێکی بچووکی تووك کورتی پێست سافە.

**bosun** (bō′s'n), *n.* = **boatswain.**

**botanic** (bə-tan′ik), *adj.* = **botanical.**

**botanical** (bə-tan′i-k'l), *adj.* (١) ڕووەکی؛ تایبەتی بە ڕووەك.
(٢) تایبەتی بە زانستی ڕووەك؛ تایبەتی بە ڕووەکزانی.
(٣) تایبەتی بە دەرمانی لە ڕووەك دەرهێنراو.
*n.* دەرمانێکە لە تونکڵ و ڕەگی ڕووەك دەگیرێتەوە.
**-botanically** *(adv.).*

**botanical garden,** باخچەی گوڵ و ڕووەك؛ گولستان.

**botanist** (bot′ə-nist), ***n.*** ڕووەکناس؛ زانای ڕووەك.
**botanize** (bot′ə-nīz′), ***v.i.*** (١) ڕووەك کۆکردنەوە بۆ لێکۆڵینەوەیان.
(٢) لێکۆڵینەوە لە ڕووەك.
***v.t.*** لێکۆڵینەوە لە ڕووەك (لە شوێنی خۆیاندا).
**botany** (bot′ə-ni), ***n.*** (١) ڕووەکزانی؛ زانستی ڕووەك.
(٢) ڕووەکی ناوچەیەك. (٣) ژیانی ڕووەکێك یا توخمە ڕووەکێك.
(٤) پەرتووکی ڕووەکزانی.
**botch** (boch), ***v.t.*** (١) بە خراپی پینەکردن.
(٢) بە ناشرینی و ناڕێك‌وپێکی و نەشارەزایانە کردن: *(to ~ a job)*.
***n.*** (١) شتێکی خراپ پینەکراو.
(٢) کارێکی بە ناشرینی و ناڕێك‌وپێکی کراو؛ کارێکی تێکدراو.
**botchy** (boch′i), ***adj.*** بە خراپی پینەکراو؛ بە ناڕێك‌وپێکی کراو.
**botfly** (bot′flī′), ***n.*** جانەوەرێکی باڵدارە کرمۆکەکەی دەبێت بە خۆرە بەسەر مرۆڤ و مەڕومالاتەوە.
**both** (bōth), ***adj. & pron.*** هەردووکیان؛ هەردوو:
***( B~ birds sang laudly, ~ were small.)***
***conj. & adv.*** ئەوەندەی یەکتر؛ وەك یەك؛ – یش:
***( I am ~ tired and hungry.)***
**bother** (both′ēr), ***v.t.*** (١) پەستکردن؛ بێزارکردن؛ سەرکردنەسەر؛ سەرئێشاندن: ***( He ~s me. ; Don't ~ me, please!)***.
(٢) سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان: ***( A big city ~s him.)***.
(٣) گوێ پێدان و مەراق خواردن:
***( Don't ~ !; She ~s too much about everything.)***
***n.*** (١) پەستی؛ هۆی پەستی؛ شتی پەستکەر؛ سەرئێشە.
(٢) کەسێکی پەستکەر: ***( He is a ~ .)***.
**botheration** (both′ēr-ā′shən), ***n. & interj.*** [Colloq.], = **bother.**
**bothersome** (both′ēr-səm), ***adj.*** پەستکەر؛ ناخۆش؛ زویرکەر.
**bo tree,** (١) دارهەنجیرێکی هیندییە
(٢) [B- T-]: داری پیرۆزی ئایینی " بوودی " یە.
**botryoidal** (bot′ri-oi′d'l), ***adj. Also*** botryoid, هێشوویی
**bottle** (bot′'l), ***n.*** (١) قاپ؛ شووشە؛ بوتڵ.
(٢) قاپێك؛ پڕ قاپێك یا بوتڵێك.
***v.t.*** (١) کردنە قاپەوە؛ کردنە بوتڵەوە.
(٢) ( ~ up )، پەنگ خواردنەوە؛ پەست خواردنەوە:
***( He ~d up his anger.)***
**hit the bottle,** [Slang], سەرکردنە خواردنەوە؛ عەرەق یا مەی زۆر خواردنەوە.
**the bottle,** عەرەق؛ مەی
**bottleneck** (bot′'l-nek′), ***n.*** (١) ملی قاپ؛ ملی شووشە.
(٢) تەنگە ڕێگە؛ تەسکە ڕێگە. (٣) کۆسپ (لە ڕێی پێشکەوتندا).
**bottlenose** (bot′'l-nōz′), ***n.*** بەرازی دەریا؛ جۆرێکە لە دۆلفین.
**bottom** (bot′əm), ***n.*** (١) بن؛ ژێر؛ قنگ: ***( the ~ of a barrel)***.
(٢) بناغە؛ بنچینە. (٣) شوێن قنگ (کورسی).
(٤) بن (ڕووبار، دەریا، گۆم): ***( the ~ of the ocean, pool, etc.)***.
(٥) نزمە زەوی؛ نزمایی.
(٦) بنی کەشتی و بەلەم؛ ئەو بەشەی کەشتی و بەلەم کە لەژێر ئاودایە.
(٧) کەشتی.
(٨) ڕەگ و ڕیشە: ***( He wanted to get to the ~ of the problem.)***.
(٩) کێش؛ تین؛ ووزە؛ گوڕ؛ دەربردن.
(١٠) ناخ؛ کانگا: ***( from the ~ of my heart)***.
(١١) [Colloq.]، قنگ؛ گووپی قنگ.
***adj.*** (١) لەبنەوە؛ لەژێرەوە؛ هی بنەوە.
(٢) نزمترین؛ کەمترین؛ دواترین؛ هەرەدوا.
***v.t.*** (١) بن تێگرتن (کورسی). (٢) تێگەیشتن.
(٢) ( ~ on ; ~ upon )، لەسەر بناغە دانان؛ لەسەر دانان.
***v.i.*** (١) گەیشتنە بنەکەی؛ لەسەر بنەکەی وەستان، دانیشتن، یا گیرسانەوە.
(٢) ( ~ on ; ~ upon )، لەسەر بناغە دانران.
**at bottom,** لە ڕاستیدا؛ لە دڵەوە: ***( At bottom they are racist.)***.
**be at the bottom of,** هۆی ڕاستەقینە بوون؛ هۆی سەرەکی بوون:
***( Their selfishness is at the bottom of the problem.)***
**bet one's bottom dollar,** [Slang], (١) لەسەر دوا دۆلار گرەوکردن.
(٢) دڵنیابوون؛ هیچ گومان نەبوون.
**bottom out,** گەیشتنە بنی بنەوە؛ گەیشتنە نزمترین پلە:
***( The price of houses has bottomed out.)***
**bottoms up!** [Colloq.], هەمووی نۆش کە!؛ هەموو قاپەکە بخۆرەوە!.
**get to the bottom of,** گەیشتنە ڕەگ و ڕیشە (کێشە، مەسەلە)؛ گەیشتنە بنج‌وبناوان.
**bottomless** (bot′əm-lis), ***adj.*** بێ بن؛ زۆر قووڵ؛ بێ کۆتایی.
**bottomless pit,** دۆزەخ؛ جەهەننەم.
**bottomry** (bot′əm-ri), ***n.*** پەیمانێکە بەگوێرەی خاوەن کەشتییەك کەشتییەکەی بە بارمتە دادەنێت بۆ ئەو قەرزەی دەیکات بۆ چوونە گەشت (ئەگەر کەشتییەکە نوقوم بوو ئەوا قەرزەکە دەسڕێتەوە).
**botulism** (boch′ə-liz'm), ***n.*** ژەهراوی بوونێکی گەلێك جار کوشندەیە لە خواردەمەنی باش هەڵنەگیراوی ناو قوتوو یا بۆگەنەوە تووشی مرۆڤ دەبێت (بەتایبەتی گۆشت).
**boudoir** (bōō′dwär, bōō-dwär), ***n.*** ژووری تایبەتی ئافرەت (بۆ دانیشتن، جل لەبەرکردن، یا نووستن).
**bouffant** (bōō-fänt′), ***n.*** پڕو هەڵئاوساو (تەنوورە).
**bougainvillaea** (bōō′gən-vil′i-ə), ***n.*** گوڵە جەهەننەمی: ڕووەکێکی گوڵ سوورو ئاڵی ڕازێنەرەوەیە.
**bough** (bou), ***n.*** لق؛ لقی درەخت (بەتایبەتی هی گەورە).
**bought** (bôt), *past tense and p.p. of* **buy.**
***adj.*** کڕاو.
**boughten** (bôt′'n), ***adj.*** [Dial.], کڕاو؛ خۆماڵی نییە:
***( ~ gloves)***
**bougie** (bōō′zhē′), ***n.*** (١) مۆم؛ فتیلە.
(٢) ئامێرێکی پزیشکی بارێکە دەکرێت بە کونێکی لەشدا وەك زێ و کۆم بۆ دۆزینەوەو دیاری کردنی نەخۆشی یا فراوان کردن.
**bouillbaisse** (bōōl′yə-bās′), ***n.*** شۆربای ماسی.
**bouillon** (bool′yon, bool-yon′, bool′yən), ***n.*** گۆشتاو.
**bouillon cube,** کۆلۆیەك گۆشتاوی خەست کراوەی ووشك کراوەیە دەکرێتە ناو چێشتەوە بۆ تام.
**boulder** (bōl′dēr), ***n.*** تلەبەرد؛ گابەرد؛ بەردە گەورە.
**boule** (bōō′lē), ***n.*** (١) پەرلەمانی یۆنانی کۆن.
(٢) [B-]، پەرلەمانی یۆنان.
**boulevard** (bool′ə-värd′, bōō′lə-värd′), ***n.*** شەقامی پان (بەتایبەتی کە ئەم بەرو ئەوبەری درەخت بێت)؛ جادە گەورە.
**bouleversement** (bōōl′vers′män′), ***n.*** [Fr.], پشێوی؛ شێواوی.
**bounce** (bouns), ***v.t.*** (١) فڕێدان و تەپە لێ هەڵساندن.
(٢) هەڵبەزاندنەوە؛ هەڵبەزودابەزکردن: ***( He ~d the ball.)***.
(٣) [Slang]، دەرکردن بە زۆر (لە شوێنێك لەبەر بەدڕەفتاری).
(٤) [Slang]، دەرکردن لە ئیش.
***v.i.*** (١) هەڵبەزینەوە (تۆپ)؛ هەڵبەزانەوە؛ هەڵبەزودابەزینکردن.
(٢) هەڵسانەوە (پاش ژێرکەوتنێك یا تێکشکانێك):
***( He will ~ back from the tragedy quickly.)***
(٣) بازدان؛ قەڵەمبازدان؛ هەڵبەزینەوە.
(٤) بە پڕتاو جووڵانەوە: ***( She ~d into the room.)***.
(٥) [Slang]، چەك بۆ گەڕانەوە لە بانقەوە بەبێ دانی چەکەکە (لەبەر بێ

پارەیی لە حسابی کەسەکەدا): *(The check ~d. ; His checks ~d.)*.
*n.* (١) هەڵبەزینەوە؛ هەڵبەزانەوە. (٢) بازد؛ قەڵەمبازد.
(٣) توانای هەڵبەزینەوە: *(The ball has lost its ~.)*.
(٤) تەپە؛ زرمە.
(٥) [British]، بێ حەیایی؛ چاوقایمی؛ بێ شەرمی.
(٦) [Slang]، هەڵمەت؛ گورج‌وگۆڵی؛ چالاکی.
**get the bounce, [Slang],** لە ئیش دەرکران؛ دەرکران.
**bouncer** (boun′sẽr), *n.* (١) شتێکی زۆر زل.
(٢) [Rare]، فشەکەر؛ فشەچی؛ درۆزن.
(٣) [Slang]، پاسەوانی بەردەرگای یانەی شەو، مەیخانە، یا چێشتخانە.
**bouncing** (boun′siŋ), *adj.* (١) خڕین؛ تەندروست؛ خڕوخۆش؛
بەهێزو تێکسمڕاو: *(a ~ baby)*. (٢) بەجۆش‌وخرۆش؛ زیندوو.
**bound** (bound), *v.i.* (١) قونەکردن؛ بازدان. (٢) هەڵبەزینەوە (تۆپ).
*v.t.* قونەپێکردن؛ هەڵبەزاندنەوە.
*n.* (١) قونە؛ بازد؛ قەڵەمبازد. (٢) هەڵبەزینەوە؛ گەڕانەوە؛ هەڵسانەوە.
**bound** (bound), *past tense and p.p. of* **bind.**
*adj.* (١) بەستراوە (٢) پێچراوە. (٣) پەیوەندی پێوەیە؛ نزیك.
(٤) مسۆگەر؛ بێ گومان: *(He's ~ to lose.)*.
(٥) پابەندبوون؛ پێویستە لەسەری؛ ناچار: *(He is legally ~ to do it.)*.
(٦) گرفت کردوو؛ قەبز؛ گیراو. (٧) بەرگ تێگراو (پەڕتووك).
(٨) [Colloq.]، سوور لەسەر.
**bound up in (or with),** (١) زۆر بۆ دڵسۆز بوون.
(٢) تێوەگلان؛ دەست تێدا بوون.
**bound** (bound), *adj.* بەرەو: *(She is ~ for home.)*.
**bound** (bound), *n.* (١) (*pl.*)، سنوور:
*(His joy knew no ~s. ; There are no ~s to his ambition.)*
(٢) (*pl.*)، ناوچەی نزیك سنوور: *(the ~s of the kingdom)*.
*v.t.* (١) سنوور بۆ دانان؛ بەستنەوە؛ بەرگرتن. (٢) بوون بە سنوور بۆ.
(٣) سنوور نیشانەکردن؛ سنوور دیاری کردن.
*v.i.* هاوسنوور بوون.
**out of bounds,** (١) لە ئەندازە بەدەر؛ لە ڕادە یا سنوور بەدەر.
(٢) لە دەرەوەی سنوور (یاریگا).
(٣) قەدەغە (جێگە)؛ بۆچوونی قەدەغەیە.
**-bound** (bound), بەشی دووەمی ووشەی لێکدراوە بەمانای: بەرەو:
*(south- bound)*
**boundary** (boun′də-ri), *n.* سنوور.
**bounden** (boun′dən), *adj.* (١) چاوبەرەوژێری چاکەیەك.
(٢) پێویست؛ ناچار: *(one's ~ duty)*.
**bounder** (boun′dẽr), *n.* [Colloq.], کەسێکی بێ ئەزاکەتی دەم-
پیسی زۆر لە خۆ دڵنیا.
**boundless** (bound′lis), *adj.* بێ ئەندازە؛ بێ سنوور؛ زۆر؛
بێ کۆتایی
**bounteous** (boun′ti-əs), *adj.* (١) بەخشندە؛ بدە؛ سەخی
(٢) فرە؛ زۆروزەبەنە؛ بێ شومار.
**bountiful** (boun′ti-fəl), *adj.* (١) بەخشندە؛ دڵ ئاوەدان؛ سەخی.
(٢) فرە؛ زۆروزەبەنە؛ بێ شومار.
**bounty** (boun′ti), *n.* (١) بەخشندەیی؛ دڵ ئاوەدانی؛ سەخێتی.
(٢) خەڵات؛ بەخشیش. (٣) پاداشت (بەتایبەتی ئەوەی کە میری دەیدات
بۆ کوشتنی گیانداری دڕندە، پەروەردەکردنی دانەوێڵەی پێویست،
بوون بە سەرباز، چەتە گرتن... هتد). (٤) بەروبووم (بەتایبەتی دانەوێڵە).
(٥) پیت.
**bouquet** (bō-kā′, bo͞o-kā′), *n.* (١) چەپکە گوڵ؛ دەسکە گوڵ.
(٢) بۆنی خۆش (بەتایبەتی هی مەی یا براندی).
**bourbon** (boor′bən, bũr′bən), *n.* بۆربۆن جۆرێکە لە ویسکی
*adj.* تایبەتی بەم خواردنەوە سەرخۆشکەرە.

**bourg** (boorg), *n.* (١) شار یا دێ (بەتایبەتی کە لە نزیك قەڵایەکەوە
بووایە لە کۆندا). (٢) شاری بازرگانی‌و ئاڵوێرو کڕین‌و فرۆشتن.
**bourgeois** (boor-zhwä′, boor′zhwä), *n.* (١) بورجوازی؛
کەسێکی بورجوازی. (٢) دووکاندار.
(٣) کەسێك کە بیروباوەڕی بورجوازیانەی هەبێت.
(٤) (*pl.*)، بورجوازیەکان.
*adj.* بورجوازی.
**bourgeoise** (boor-zhwäz′), *n.* ژنێکی بورجوازی.
**bourgeoisie** (boor′zhwä′zē′), *n.* (١) چینی بورجوازی.
(٢) چینی سەرمایەدار.
**bourgeon** (bũr′jən), *n., v.t. & v.i.* = **burgeon.**
**bourn, bourne** (bôrn, bōrn, boorn), *n.* جۆگەلە؛ جۆگە.
**bourn, bourne** (bôrn, bōrn, boorn), *n.* (١) شوێنی مەبەست؛
ئامانج. (٢) [Poetic]، مەرز. (٣) [Archaic]، سنوور.
**bourse** (boors), *n.* بۆرسە؛ بازاڕی پارەبازی‌و ئاڵوێر.
**bouse** (bo͞oz, bouz), *n.* (١) خواردنەوە.
(٢) خواردنەوەی سەرخۆشکەر. (٣) ئاهەنگی خواردنەوە.
(٤) [Colloq.]، خواردنەوەی سەرخۆشکەری خراپ.
*v.t. & v.i.* مەی خواردنەوە؛ عەرەق خواردنەوە.
**bouse** (bous, bouz), *v.t. & v.i.* بەرزکردنەوە (بە گوریس‌و
خولخولۆکە).
**boustrophedon** (bo͞o′strə-fē′d'n), *n.* شێوازێکی نووسینی
کۆنە بریتییە لە نووسینی دێڕێك لە ڕاستەوە بۆ چەپ‌و دێڕێك بەپێچەوانەوە
**bout** (bout), *n.* (١) هاتوچۆ (جووت کردن)؛ وەرگەڕانەوە؛ پێچکردنەوە.
(٢) ملەملێ؛ زۆرانبازی: *(a boxing ~)*.
(٣) (ا) ماوە (کە بە شتێکی تایبەتییەوە ببرێتە سەر)؛ دەم:
*(a drinking ~ ; a ~ of floor scrubbing)*
(ب) ماوە (نەخۆشی گرتن): *(a ~ of fever, influenza, etc.)*.
**boutique** (bo͞o-tēk′), *n.* دووکانی تاك فرۆشی جل‌وبەرگی مۆدەو
شتی تری ژنانە.
**boutonniere** (bo͞o′t'n-yer′), *n.* گوڵی یەخەی چاکەت.
**bovid** (bō′vid), *adj.* ئاژەڵی (کە گاو مانگاو مەڕو بزن دەگرێتەوە)؛
گاومانگایی.
**bovine** (bō′vīn, bō′vin), *adj.* (١) مانگایی؛ ڕەشەووڵاخی؛
گاجووتی. (٢) لە گاو مانگا دەچێت. (٣) سست؛ بێ مێشك‌و هێواش.
*n.* گا؛ مانگا.
**bow** (bou), *v.i.* (١) چەمینەوە؛ چەمانەوە؛ نووشتانەوە.
(٢) سەر دانەواندن یا کڕنووش بردن (لەبڕووی ڕێز، ڕەزامەندی، سڵاوەوە).
(٣) مل شۆڕکردن؛ سەرشۆڕکردن؛ کڕنووش بۆ بردن (ترس).
*v.t.* (١) نووشتانەوە؛ چەماندنەوە.
(٢) سەر دانەواندن (لەبڕووی ڕێز، ڕەزامەندی، یا سوپاسەوە)؛ کڕنووش بۆ بردن.
(٣) نەواندن؛ پساندن: *(The load ~ed him down.)*.
*n.* سەردانەواندن؛ کڕنووش.
**bow out,** خۆکشانەوە؛ دەست هەڵگرتن.
**make one's bow,** (١) دەستکردن بە خۆنوواندن.
(٢) خۆ خانەنشین کردن (بەتایبەتی بۆ نوێنەر یا کاربەدەستی ڕامیاری).
**take a bow,** سەردانەواندن (لەبڕووی سوپاسەوە بۆ چەپڵەلێدانی جەماوەر
پاش خۆنوواندنێك یا پێناسینێك).
**bow** (bō), *n.* (١) کەوانە؛ پەلکە: *(rainbow)*.
(٢) پێچ. (٣) کەوان (تیروکەوان): *(~ and arrow)*.
(٤) (*pl.*)، تیرهاوێژان؛ تیرەوانان. (٥) کەوانەی کەمانچە.
(٦) گرێی قوڵفە؛ گرێی قوڵفەدار. (٧) (ا) چوارچێوەی چاویلکە.
(ب) ئەو بەشەی ئەم چوارچێوەیە کە لەسەر گوێچکە ڕادەوەستێت.
**bow** (bou), *n.* (١) بەشی پێشەوەی بەلەم‌و کەشتی.
(٢) سەوڵ لێدەری پێشەوەی بەلەم‌و کەشتی.

*adj.* تایبەتی بە بەشی پێشەوەی بەلەمو کەشتی.
**bow compass,** پرگالی کەوانەیی.
**bowdlerize** (boud′lēr-īz′), *v.t.* پاکردنەوەی پەرتووکێك لە ووشەو ڕستەی ناشرینو نابەجێ.
**bowel** (bou′əl, boul), *n.* (١) ڕیخۆلە
(٢) (*pl.*)، ناوجەرگە؛ ناوەوە: *( the ~s of a mountain)* .
(٣) (*pl.*)، [Archaic]، دەروون؛ هەناو؛ هەستی ناسك.
*v.t.* ڕیخۆلە دەرهێنان
**move one's bowels,** پیسایی کردن؛ گووکردن.
**bowel movement,** (١) پیسایی کردن؛ گووکردن. (٢) پیسایی؛ گوو.
**bower** (bou′ēr), *n.* (١) کەپر؛ سابات؛ چەرداخ.
(٢) [Poetic]. کوختەیەکی لادێ. (٣) [Archaic]، boudoir .
*v.t.* کەپر درووستکردن؛ بە دارو گەڵا دەورگرتن؛ سابات بۆ کردن.
**bower** (bou′ēr), *n.* یەکێکە لە بەنرخترین دوو کاغەزی یاری کاغەز.
**bower** (bou′ēr), *n.* قورسترین لەنگەری کەشتی (لەپێشەوە دادەنرێت).
**bowerbird** (bou′ēr-būrd′), *n.* باڵندەیەکە وەك قەلەڕەشکە نێرینەکانیان هێلانەی جوان دەکەن بۆ سەرنج ڕاکێشانی مێینەکانیان.
**bowery** (bou′ēr-i), *adj.* (١) ساباتی؛ وەك کەپر یا سابات.
(٢) سێبەر
**bowery** (bou′ēr-i), *n.* (١) کێڵگەی کەسێکی هۆڵەندی لە نیویۆرك لە کۆندا. (٢) [B-]. شەقامی میوانخانەو مەیخانەی هەرزانە لە نیویۆرك.
**bowfin** (bō′fin′), *n.* جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە.
**bow hand,** (١) دەستی کەوان (تیروکەوان هاویشتن).
(٢) دەستی کەوانە (کەمانچە ژەندن).
**bowhead** (bō′hed′), *n.* جۆرە نەهەنگێکی سەرچەماوەیە.
**bowie knife,** چەقۆیەکی دەبانی گەورەی کیفداری ڕاوکردنە.
**bowknot** (bō′not′), *n.* گرێی قولفە؛ گرێی قولفەدار.
**bowl** (bōl), *n.* (١) کاسە؛ تاسە؛ قاپێکی قووڵ.
(٢) کووپ یا تاسەی مەی خواردنەوە. (٣) مەی؛ عەرەق؛ خواردنەوە.
(٤) خواردنەوەی ناو ئاهەنگ؛ گەلە خواردنەوە.
(٥) بەشی لە تاسەچووی شتێك (وەك دەمی کەوچك).
(٦) یاریگای تەلاندار؛ یاریگای خڕ.
(٧) پڕ کاسەیەك، تاسێك، یا قاپێکی قووڵ: *( a ~ of soup)* .
**bowl** (bōl), *n.* (١) تۆپی یاری " بۆلینگ " .
(٢) فڕێدان یا خل کردنەوەیەکی ئەم تۆپە.
(٣) پارچەیەکی خڕ یا لوولەکی (مەکینە).
*v.i.* (١) یاری " بۆلینگ " کردن. (٢) فڕێدانو خولاندنەوەی تۆپ.
(٣) ( ~ along )، بەخێراییو نەرمی ڕۆیشتن.
*v.t.* (١) خولاندنەوە؛ فڕێدانو خولاندنەوە.
(٢) خێرا لێخوڕین لەسەر پێچکە.
**bowl over,** (١) خستن (بە خولاندنەوەو پیادانی شتێکی خڕ).
(٢) [Colloq.]، سەرسووڕماندن؛ واق ووڕماندن؛ سەر لێ شێواندن.
**bowlder** (bōl′dēr), *n.* = **boulder.**
**bowleg** (bō′leg′), *n.* لاقی چەماوە (لە کلاوەی ئەژنۆدا).
**bowlegged** (bō′leg′id, bō′legd′), *adj.* لاق چەماوە؛ گەڵ بلاو؛ لاق خوار.
**bowler** (bōl′ēr), *n.* یاریکەری یاری " بۆلینگ " .
**bowler** (bōl′ēr), *n.* شەپقەیەکی خڕی قەراغ هەڵگەڕاوەی سافو لووسە.
**bowline** (bō′lin, bō′līn′), *n.* (١) گوریسی بایەوان (کەشتی با).
(٢) گرێ کوێرە.
**bowling** (bō′liŋ), *n.* یاری " بۆلینگ " بریتییە لە خل کردنەوەی تۆپێکی قورس بەسەر ڕوویەکی تەختی سافدا بۆ لێدانو خستنی نیشانی دارین لە دووری پانزە مەترەوە.
*adj.* تایبەتی بە یاری " بۆلینگ " .
**bowling alley,** (١) خانەی " بۆلینگ " : ئەو خانە درێژو باریکەیە کە تۆپی لێوە خل دەکرێتەوە بۆ نیشان خستن لە یاری " بۆلینگ " دا.
(٢) یاریگای " بۆلینگ " .
**bowling green,** چیمەنی یاری " بۆلینگ " .
**bowman** (bō′mən), *n.* تیرەوان؛ تیرهاوێژ؛ تیروکەوانچی.
**bowman** (bou′mən), *n.* سەوڵ لێدەری پێشەوەی بەلەم.
**bow pen,** پرگالێکی قەڵەمدارە.
**bowsprit** (bou′sprit′, bō′sprit′), *n.* دارێکی ئەستووری درێژی لارە لەبەردەمی کەشتی باوە درێژدەبێتەوە (گوریسی قایم کردنی تەوەری کەشتییەکەی پێوە دەبەسترێت).
**bowstring** (bō′striŋ′), *n.* (١) تەلی تیروکەوان.
(٢) تەلێکی سووكو قایمە.
*v.t.* بە تەل خنکاندن.
**bow tie,** بۆینباخی گوڵبەست.
**bow window,** پەنجەرەیەکی دەرپەڕیوی کەوانەییە.
**bowwow** (bou′wou′), *n.* وەڕین؛ وەڕەی سەگ
*v.i.* وەڕین.
**bowyer** (bō′yēr), *n.* (١) کەوانفرۆش؛ کەوان درووستکەر.
(٢) تیرهاوێژ؛ تیروکەوانچی.
**box** (boks), *n.* (١) سنووق؛ قوتو. (٢) پڕ سنووقێك؛ پڕ قوتویەك.
(٣) دیاری ناو سنووق.
(٤) کورسی عەرەبانچی (کە لە هەمان کاتدا سنووقی ئامێر هەڵگرتنیشە).
(٥) کورسی شۆفێر. (٦) شتێك کە لە کورسی بچێت.
(٧) لۆج (سینەما، یاریگا). (٨) قەفەزە یا ژوورۆچکەی کارگەرانی دەرەوە.
(٩) کوختەی ڕاوکەران. (١٠) تەویلەی ئەسپ.
(١١) لۆجێکی تایبەتی: *( a press ~ ; a jury ~ )* .
(١٢) کورتە ووتارێکی چوارچێوە تێگیراوی ناو ڕۆژنامەیەك.
(١٣) جێگەی وەستانی یاریکەری " بێسبۆڵ " .
(١٤) کیف (مەکینە). (١٥) بارێکی ناقۆڵا یا سەر لێ شێوێن.
(١٦) [Vulgar]، قوز.
*v.t.* خستنەناو سنووقەوە.
*adj.* (١) لە سنووق دەچێت. (٢) لە سنووقدا پێچراوەتەوە.
**box in,** (١) دەورەدان؛ ئابلووقەدان؛ بەستنەوە؛ قەتیس کردن.
(٢) بەرگرتنی یاریکەرێك بۆ ئەوەی پێش نەکەوێت لە پێشبڕکێیەکدا.
**box up,** ئابلووقەدان؛ بەستنەوە؛ دەورەدان.
**box** (boks), *n.* مستەکۆڵە؛ بۆکس.
*v.t.* (١) مستەکۆڵەلێدان؛ بۆکس پیاکێشان.
(٢) شەڕە مستەکۆڵە کردن؛ بۆکسبازی لەگەڵ کردن.
*v.i.* (١) شەڕە بۆکس کردن. (٢) بوون بە بۆکسباز.
**box** (boks), *n.* (١) درەختێکی هەمیشە سەوزی گەڵا جیڕی گوڵ بچووکە.
(٢) داری ئەم درەختە.
**boxcar** (boks′kär′), *n.* فارگۆنی بار.
**box coat,** (١) پاڵتۆی عەرەبانچی. (٢) پاڵتۆی باران.
**boxer** (bok′sēr), *n.* (١) بۆکسباز.
(٢) جۆرە سەگێکی مام ناوەندی تووك کورتە.
**boxful** (boks′fəl), *adj.* پڕ سنووقێك؛ قوتویەك.
**boxing** (bok′siŋ), *n.* بۆکسبازی؛ شەڕە بۆکس.
**boxing** (bok′siŋ), *n.* (١) خستنەناو سنووقەوە؛ شت پێچانەوە لە سنووقدا. (٢) بەرگ؛ قاوغ. (٣) شتی سنووق لێ درووستکراو (تەختەو مقەبا)
**boxing gloves,** دەستکێشی بۆکسبازی
**box office,** پەنجەرەی بلیت فرۆشتن (سینەما، شانۆ)؛ بلیتخانە.
**good box office,** [Slang], خەڵك ڕاکێش (فیلم، شانۆگەری)؛ بەبرەو.
**box seat,** کورسی لۆج.
**box spring,** ئیسپرنگی چەرپایە.
**box stall,** تەویلەی چوارگۆشەیی (بۆ ئەسپ یا مانگا).
**boy** (boi), *n.* (١) کوڕ؛ منداڵی نێرینە؛ لاو. (٢) پیاو؛ کابرا.

(٣) بەردەست؛ خزمەتکاری ناومال.
(٤) بەردەستی ئوتێل (بۆ جانتا هەڵگرتن و ووردە نیش).
(٥) [Colloq.]، کوڕ: *( He's my ~ .)* .
*interj.* [Slang], . *( Oh, ~ ! )* پەححا! نیشانەی سەرسامی یا خۆشییە:
**boyar** (bô-yär′, boi′ẽr), *n.* بەگزادەیەکی ڕوسیای قەیسەرییە.
**boyard** (bô-yärd′, boi′ẽrd), *n.* = boyar.
**boycott** (boi′kot′), *v.t.* (١) پەیوەندی لەگەڵ بڕین؛ لێ تەکینەوە.
(٢) قەدەغەکردنی ئالوویر یا بازرگانی لەگەڵدا:
*( to ~ a newspaper, company, restaurant, product, etc.)*
*n.* (١) پەیوەندی پچڕاندن. (٢) قەدەغەکردنی ئالوویر یا بازرگانی.
**boy friend,** [Colloq.], یار (کوڕ)؛ دڵدار.
**boyhood** (boi′hood), *n.* (١) کاتی منداڵی، کوڕێتی، یا لاوێتی.
(٢) کوڕان؛ کوڕوکاڵ؛ منداڵان.
**boyish** (boi′ish), *adj.* کوڕانی؛ کوڕانە؛ منداڵانە: *( a ~ face)* .
**boy scout,** (١) ئەندامێکی دیدەوانی کوڕان.
(٢) [Slang]، کەسێکی ساویلکە.
**Boy Scouts,** ڕێکخراوی دیدەوانی کوڕان
**boysenberry** (boi′s'n-ber′i, boi′z'n-ber′i), *n.* میوەیەکە لە تووترک دەچێت.
**bra** (brä), *n.* = brassiere.
**brabble** (brab′'l), *v.i.* دەمەقرێ کردن؛ شەڕە دەنووک کردن؛ دەمەقاڵێ بوون.
*n.* دەمەقرێ؛ شەڕە دەنووک؛ دەمەقاڵێ.
**brace** (brās), *v.t.* (١) پێوەبەستن بە قایمی؛ پێوە قایم کردن.
(٢) توندکردنەوە بە ڕاکێشان؛ جەڕاندن و قایم کردن؛ شەتەکدان.
(٣) شت خستنەپاڵ بۆ قایمی؛ هەڵپەساردن؛ پاڵپشت کردن؛ لەنگەرگرتن.
(٤) ئامادەکردن و گورج کردنەوە (بۆ بەرهەڵستی کردنی هێرش).
(٥) خستنە جۆش؛ جووڵاندن؛ بزواندن؛ وورياکردنەوە؛ بەهێزکردن؛ بووژاندنەوە. (٦) [Slang]، داوای قەرز لێکردن.
*n.* (١) جووت؛ دوو؛ دووان. (٢) گیرە؛ قولاپ.
(٣) (*pl* )، [British]، **suspenders** .
(٤) پەت، گوریس، یا ئامێری شەتەکدان.
(٥) کەوانەی وەك ئەمە { } . (٦) کۆڵەکە؛ دیرەك؛ پاڵپشت.
(٧) (ا) ئێسکبەند؛ ئێسکگرە (بۆ ڕاگرتنی ئەندامی ئیفلیج بووی لەش).
(ب) ددانبەند تەلێکە دەکرێتە ددانەوە بۆ ڕاستکردنەوەی ددانە خواروخێچەکان و ڕاستکردنەوەیان یا نەهێشتنی کەلەفیچی.
(٨) دەسکی درەوشەو ئامێری تری کونکەر.
**brace up,** [Colloq.], خۆ گورج کردنەوەو ئامادەکردن:
*( to brace up for any problem that may arise.)*
**brace and bit,** جەرِبادەری پێچ خۆر؛ جەڕی کونکەر
**bracelet** (brās′lit), *n.* (١) بازن (٢) [Colloq.] ، کەلەپچە
**bracer** (brās′ẽr), *n.* مەچەکبەند؛ قۆڵبەند (بۆ تیرهاوێژی و شەڕەشیر)
**bracer** (brās′ẽr), *n.* (١) گورجکەرەوە (مرۆڤ، شت)
(٢) [Slang]. خواردنەوەیەکی هۆشیارکەرەوە
**brach** (brach), *n.* [Archaic], دەڵەسەگ.
**brachial** (brā′ki-əl, brak′i-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە قۆڵ؛ هی قۆڵ (٢) تایبەتی بە شتێکی وەك قۆڵ.
**brachialgia** (brā′ki-al′ji-ə, brak′i-al′ji-ə), *n.* ئازاری قۆڵ؛ قۆڵ ئێشە.
**brachiate** (brā′ki-it, brak′i-it), *adj.* دوولق دوولقی؛ لقەکانی دووان دووانەن.
**brachio-** (brā′ki-ō, brak′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: قۆڵ؛ هی قۆڵ.
**brachiopod** (brā′ki-ə-pod′, brak′i-ə-pod′), *n.* گیاندارێکی بچووکی بێ بڕبڕاگەی قاوغداری دەریاییە دوو ئەندامی وەك قۆڵی هەیە لەتەنیشت دەمییەوە.

**brachium** (brā′ki-əm, brak′i-əm), *n.* (١) بەشی ژوورووی قۆڵ (لەنێوان شان و ئانیشکدا)؛ بازوو. (٢) ئەندامێکی وەك قۆڵ (زیندەوەرزانی).
**brachy-** (brak′i), پێشگرێکە بەمانای: کورت.
**brachycephalic** (brak′i-sə-fal′ik), *adj.* سەرکورت؛ سەرپان؛ کەللەی کورت و پان. (هەروەها " **brachycephalous** ").
-brachycephaly *(n.).*
**brachydactylic** (brak′i-dak-til′ik), *adj.* پەنجەی دەست و پێ کورت.
**brachylogy** (brə-kil′ə-ji), *n.* (١) ووتە کورتی.
(٢) ووتەیەکی کورتکراوە.
**brachyuran** (brak′i-yoor′ən), *adj.* کلك کورت (زیندەوەرزانی).
*n.* قرژاڵ.
**bracing** (brās′iŋ), *adj.* خۆش (ئاووهەوا)؛ مووچڕك پیاهێنەر؛ بزوێنەر: *( a ~ climate ; ~ air )* .
*n.* (١) پاڵپشت؛ کۆڵەکە. (٢) ئاسقی پانتۆڵ.
**bracken** (brak′ən), *n.* جۆرە ڕووەکێکە.
**bracket** (brak′it), *n.* (١) گۆشەی ژێر ڕەفە.
(٢) ڕەفەی سەر دیوار (کە لەسەر گۆشە ڕاگیرکرابێت).
(٣) شتێکی جێگیر بە دیوارێکەوە بۆ شت لەسەر دانان.
(٤) کەوانەیەکە لەم شێوەیە { } . (٥) شتی ناو کەوانە.
(٦) بابەت؛ جۆر؛ پۆل:
*( There are several income ~ . ; the low- income ~ )*
(٧) مەودای نێوان دوو گوللە تۆپ یەکێکیان لە نیشان تێپەڕبووبێت و ئەوی تریان نەیگەیشتبێتێ.
*v.t.* (١) گۆشە دانە بەر؛ بە گۆشە قایم کردن (ڕەفە). (٢) خستنەناو کەوانەوە.
(٣) پۆل پۆل کردن؛ هاوپۆل کردن. (٤) گوللە تۆپ هاویشتن دوورتر لە نیشان و نزیکتر لە نیشان بۆ دۆزینەوەی دووری تەواو.
**brackish** (brak′ish), *adj.* (١) سوێر؛ خوێیاوی.
(٢) دڵ تێکهەڵهێنەر؛ ناخۆش.
**brackt** (brakt), *n.* گەڵای بچکۆلەی بن گوڵ یا سەر لاسکەکەی.
-bracteal *(adj.).*
**bracteate** (brak′ti-it), *adj.* گەڵای بچکۆلەدار.
**bracteole** (brak′ti-ōl′), *n. Also* **bractlet,** گەڵای بچکۆلەی بن گوڵ یا سەر لاسکەکەی.
-bracteolate *(adj.).*
**brad** (brad), *n.* بزمارێکی بارێکی سەر بچووك یا بێ سەر.
**bradawl** (brad′ôl′), *n.* درەوشە.
**brady-** (brad′i), پێشگرێکە بەمانای: سست؛ خاو؛ هێواش.
**bradycardia** (brad′i-kär′di-ə), *n.* دڵ هێواش لێدان.
**brag** (brag), *v.t. & v.i.* خۆهەڵکێشان؛ فشەکردن؛ گەزاف لێدان.
*n.* (١) فشە؛ خۆهەڵکێشان؛ لاف و گەزاف؛ هووشە.
(٢) خۆهەڵکێش؛ فشەکەر؛ لاف و گەزاف لێدەر؛ هووشەکەر.
(٣) یارییەکی کۆنی کاغەزە.
*adj.* [Archaic], (١) بەدەماخ؛ چالاك.
(٢) دەمێنێت خۆی پێوە هەڵبکێشرێت.
**braggadocio** (brag′ə-dō′shi-ō′), *n.* (١) فشەکەر؛ خۆهەڵکێش.
(٢) فشەکردن؛ خۆهەڵکێشان.
**braggart** (brag′ẽrt), *n.* کەسێکی فشەکەر یا خۆهەڵکێش؛ کەسێکی فشەکەرو لاف و گەزاف لێدەر.
*adj.* فشەکەر؛ خۆهەڵکێش.
**bragger** (brag′ẽr), *n.* کەسێکی فشەکەر؛ کەسێکی خۆهەڵکێش و لاف و گەزاف لێدەر.
**Brahma** (brä′mə), *n.* (١) براهما: گیان یا گەوهەری جیهان.
(٢) یەزدان (ئاینی هیندۆسی).
(٣) جۆرە ڕەشەوڵاخێکی هیندی غەبغەبەداری کۆپارەدارە.

**Brahma, brahma** (brä′mə, brā′mə), ***n.*** مریشکی پەرلەپێ.
**Brahman** (brä′mən), ***n.*** براهمی. ئەندامێکی بەرزترین چینی
کۆمەڵایەتی هیندییە کە بریتی بوو لە مەلاو پیاوە ئاینییەکان.
**Brahmanism** (brä′mən-iz'm), ***n.*** (۱) ئاینی هیندی.
(۲) ڕێبازی چینایەتی هیندستانی کۆن.
**Brahmin** (brä′min), ***n.*** (۱) **Brahman** .
(۲) بەگزادەیەکی خوێندەواری کۆنەپەرست یا لووت بەرز.
**braid** (brād), ***v.t.*** (۱) هۆنینەوە (قژ، پووش)؛ چنین؛ کلافەکردن
(۲) قژ بەستنەوە (بە قەیتان، شریت، یا لاستیک). (۳) چنین (بەڕە، فەرش).
(٤) ڕازاندنەوە بە نەخش‌ونیگاری چنراو.
***n.*** (۱) شریتێکی هۆنراوە یا چنراو. (۲) پرچی هۆنراوە؛ پرچی کلافەکراو.
(۳) پارچەیەک قوماشی نەخش‌ونیگار لەسەر چنراو کە شتی پێ دەڕازێنرێتەوە.
(٤) شریت یا لاستیکی پرچ پێ بەستنەوە.
**braiding** (brād′iŋ), ***n.*** (۱) پرچی هۆنراوە؛ شریتی هۆنراوە
(۲) پارچە قوماشی نەخش‌ونیگار لەسەر چنراو بۆ شت ڕازاندنەوە؛
نەخش‌ونیگاری چنراو.
**brail** (brāl), ***n.*** گوریسی هەڵکردنی بایەوانی کەشتی با.
***v.t.*** **( ~ up ),** هەڵکردنی بایەوانی کەشتی با.
**Braille, braille** (brāl), ***n.*** برەیل. شێوەی نووسین‌و لەچاپدانە بۆ
کوێرەکان (کە بریتییە لە تیپ‌و ژمارەی چوکڵەدار).
***v.t.*** نووسین‌و لەچاپدان بۆ کوێرەکان
**brain** (brān), ***n.*** (۱) مێشک؛ دەماخ.
(۲) (*pl.*)، زیرەکی؛ ژیری
***v.t.*** مێشک پژاندن
**beat one's brain,** زۆر هەوڵدان (بۆ هاتنەوەبیر، فێربوون، یا لێکدانەوە).
**have on the brain,** خولیابوون؛ هەمیشە لەبیربوون.
**brain cell,** خانەی مێشک؛ شانەی مێشک.
**brain child,** [Colloq.]. بەرهەمی مێشکی (بیر، نەخشە، بیردۆز)؛
کردار
**brain fever,** = **encephalitis.**
**brainless** (brān′lis), ***adj.*** بێ مێشک؛ مێشک پووت؛ کەر.
**brainpan** (brān′pan′), ***n.*** کاسەی سەر؛ کەللە.
**brainsick** (brān′sik′), ***adj.*** (۱) شێت؛ مێشک نەخۆش
(۲) هۆی شێتییە.
**brain storm,** (۱) شێتییەکی سەردەمی؛ ڕاتەکانی مێشک؛ فێ.
(۲) [Colloq.]. بیرێکی دانایانە یا شێتۆکانەی لەپڕ.
**brainstorming** (brān′stôrm′iŋ), ***n.*** کۆڕگرتنی ئازاد یا بێ جڵەو
(بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو نەخشەدانان).
**brain trust,** [Slang]. دەستەی شارەزایان
**brainwash** (brān′wôsh′, brān′wäsh′), ***v.t.*** مێشک شتنەوە؛
مێشک گۆڕین؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ بیروباوەڕ پێ گۆڕین (بە زۆر یا بە خۆشی)؛
بەهەڵەدابردن؛ بیروباوەڕی تازە خستنە مێشکەوەو لەبیربردنەوەی بیروباوەڕی
جاران بە پڕوپاگەندە.
**brainwashing** (brān′wôsh′iŋ, brān′wäsh′iŋ), ***n.*** مێشک-
شتنەوە؛ مێشک پێ گۆڕین؛ هەڵگەڕاندنەوە (لە ڕێبازو بیروباوەڕی جاران)؛
بیروباوەڕ پێ گۆڕین (بە زۆر یا بە خۆشی)؛ بەهەڵەدابردن؛ بیروباوەڕی تازە
خستنە مێشکەوەو لەبیربردنەوەی بیروباوەڕی جاران بە پڕوپاگەندە.
**brain wave,** (۱) [Colloq.]، بیرێکی دانایانەی کوتوپڕ.
(۲) شەپۆلی مێشک.
**brainy** (brān′i), ***adj.*** [Colloq.]. زیرەک؛ زرنگ؛ ژیر.
**-braininess** ***(n.).***
**braise** (brāz), ***v.t.*** زەردکردن‌و کوڵاندن لە ئاوێکی کەمدا (گۆشت،
سەوزەوات)
**brake** (brāk), ***n.*** جۆرە ڕووەکێکە.
**brake** (brāk), ***n.*** (۱) ئامێری کوتانی کەتان‌و پەموو بۆ جیاکردنەوەی
ڕیشاڵەکانی. (۲) ئامێری هەویر شێلاندن. (۳) چوارمێخە؛ مەکۆ.
(٤) ماڵەی ئاسن (بۆ شکاندنی کوڵۆو تەخت کردنی کێڵگە).
(٥) دەسک (پەمپ، مەکینە): ***( a pump ~ )*** .
(٦) وەستێنەر (ئوتومبیل، شەمەندەفەر).
(۷) (*pl.*)، هێواشکەرەوە؛ خاوکەرەوە؛ وەستێنەر.
***v.t.*** (۱) کوتان (کەتان، پەموو، کەرسەک)؛ هاڕین. (۲) شێلان (هەویر).
(۳) وەستاندن؛ هێواش کردنەوە؛ ئیستۆپ گرتن.
***v.i.*** (۱) وەستاندن؛ هێواش بوونەوە. (۲) وەستان؛ هێواش بوونەوە.
**brake** (brāk), ***n.*** بێشە؛ بێشەڵان؛ چڕستان.
**brake** (brāk), ***n.*** عەرەبانە.
**brake** (brāk), *archaic past tense of* **break.**
**brakeage** (brāk′ij), ***n.*** (۱) کاری وەستێنەر؛ بەکارهێنانی وەستێنەر.
(۲) توانای وەستێنەر.
**brake drum,** تەپڵی وەستێنەر.
**brake horsepower,** هێزی ئەسپینەی مەکینەیەک.
**brake lining,** بەری وەستێنەر یا برێک.
**brakeman** (brāk′mən), ***n.*** کارگەری وەستێنەری شەمەندەفەر.
**brake shoe,** کەوشی وەستێنەر.
**bramble** (bram′b'l), ***n.*** (۱) تووتڕک؛ ڕووەکێکی وەک تووتڕک.
(۲) هەر جۆرە ڕووەکێکی دڕکاوی.
**brambling** (bram′bliŋ), ***n.*** فیسقە؛ باڵندەیەکە وەک فیسقە.
**brambly** (bram′bli), ***adj.*** (۱) تووتڕکاوی. (۲) دڕکاوی.
**bran** (bran), ***n.*** (۱) کەپەک. (۲) دانەوێڵەو بەرهەمی دانەوێڵەیە کە شیری
دەکرێت بەسەرداو بۆ بەرچایی دەخورێت.
**branch** (branch, bränch), ***n.*** (۱) لق؛ پەل؛ چڵ؛ تووڵ؛ خەڵف.
(۲) جۆگەلە؛ جۆگە. (۳) زێ.
(٤) بەش؛ لق: ***( Chemistry is a ~ of learning.)*** .
(٥) پەل (خێزان، تیرە).
(٦) لق (کۆمەڵە، حیزب، بازرگانی، چێشتخانە... هتد):
***( The store has four ~es.)***
***v.i.*** (۱) تەرزفڕێدان؛ لق هاویشتن؛ پەل فڕێدان.
(۲) لق لێبوونەوە؛ لق لێ جیابوونەوە.
***v.t.*** (۱) بەش بەش کردن؛ پەل پەل کردن. (۲) ڕازاندنەوە بە لق‌و گەڵا
**branch off,** (۱) بوون بە لق لقەوە؛ بوون بە چەند لقێکەوە.
(۲) جیابوونەوە؛ لێ جیابوونەوە.
**branch out,** (۱) تەرزفڕێدان؛ لق هاویشتن؛ پەل فڕێدان.
(۲) پەرەسەندن؛ تەنینەوە.
**brand** (brand), ***n.*** (۱) بزووتک؛ سەرە بزووتک.
(۲) نیشانەی داخ کردن (نیشانەکردنی مەڕومالات، سزادانی مرۆڤ).
(۳) شیشی داخ (بۆ داخ کردن یا سمین).
(٤) لەکە؛ نیشانەی ئابڕووچوون.
(٥) نیشان (فرۆتەنی)؛ نیشانی تایبەتی کۆمپانیایەک لەسەر فرۆتەنییەک.
(٦) جۆر؛ چەشن: ***( a ~ of cigarettes)*** .
(۷) نەخۆشییەکی ڕووەکە (گەڵاکانی قرچ هەڵدێنێت).
(۸) جانەوەری ئەم نەخۆشییە.
(۹) [Archaic & Poetic]، شمشێر.
***v.t.*** (۱) داخ کردن؛ نیشانەکردن (ئاژەڵ)؛ سمین. (۲) نیشان کردن.
(۳) لەکەدارکردن؛ سووک کردن.
**brandied** (bran′did), ***adj.*** براندی تێکراوە (بۆ تام‌و بۆن)؛
براندی تێدایە.
**brandish** (bran′dish), ***v.t.*** ڕاوەشاندن بە هەڕەشەوە (چەقۆ،
شمشێر، دار).
***n.*** ڕاوەشاندنێک بە هەڕەشەوە.
**brandling** (brand′liŋ), ***n.*** کرمی زەوی (ڕاوکەری ماسی بۆ دان
بەکاری دەهێنن).

**brand-new** (brand′nōō′, brand′nū′), *adj.* تازە؛ نوێ
**brandy** (bran′di), *n.* براندی: خواردنەوەیەکی کحوولییە.
*v.t.* براندی تێکردن؛ بە براندی خۆش کردن.
**branks** (braŋks), *n.pl.* لغاوی مزۆ (لە کۆندا دەکرایە دەمی ئافرەتی بێ حەیاو دەمەوەڕەوە).
**brant** (brant), *n.* جۆرە قازێکی کێوی ڕەشی بچووکە.
**brash** (brash), *adj.* (١) قرچۆك؛ ناسك. (٢) هەڵەشە؛ سەرچڵ. (٣) بێ حەیا؛ بێ شەرم.
*n.* (١) سك ئێشە. (٢) بارانێکی کوتوپڕ.
**brash** (brash), *n.* (١) پارچە بەرد یا سەهۆڵی شکاو. (٢) لق و تەرزی بڕراو.
**brasier** (brā′zhēr), *n.* = **brazier.**
**brass** (bras, bräs), *n.* (١) مسی زەرد؛ زەرد؛ مس. (٢) (*pl.*). شتی مسین. (٣) (*pl.*)، ئامێری مۆسیقایی مس. (٤) ڕەقی؛ سەختی. (٥) [Colloq.]، بێ حەیایی؛ چاوقایمی؛ بێ شەرمی. (٦) [Slang]. پارە؛ پوول و پارە؛ دراو. (٧) [Slang]. ئەفسەری گەورە. (٨) ئاوپۆشی گرنج گرنجی بورغو.
*adj.* مسین؛ مس؛ لە مس دروستکراو.
*v.t.* مس تێگرتن
**brassage** (bras′ij, bräs′ij), *n.* مزی سکەلێدان.
**brassard** (bras′ärd, brə-särd′), *n.* (١) قەڵغانی بازوو (کە لە ئانیشکەوە هەتا سەرشان دادەپۆشێت). (٢) باڵبەند (بە درووشم یا نیشانەوە)؛ بازووبەند.
**brassart** (bras′ērt), *n.* = **brassard.**
**brass band,** تیپی مۆسیقای مسین (بە ئامێری مسین مۆسیقا لێدەدەن).
**brass hat,** [Slang], (١) ئەفسەری " پوکن ". (٢) ئەفسەری گەورە.
**brassie** (bras′i, bräs′i), *n.* داری سەرمس (یاری گۆلف).
**brassiere** (brə-zêr′, bras′i-er′), *n.* سوخمەی مەمك؛ مەمك بەند؛ سینەبەند
**brassily** (bras″l-i, bräs″l-i), *adv.* بە بێ حەیایانە؛ بە بێ شەرمانە.
**brassiness** (bras′i-nis, bräs′i-nis), *n.* بێ حەیایی؛ بێ شەرمی.
**brass knuckles,** بۆکسی ئاسن (شەڕ).
**brass tacks,** [Colloq.], شتی گرنگ؛ ڕاستییە سەرەکییەکان.
**get (or come) down to brass tacks,** [Colloq.]. باسکردنی ئەو شتانەی کە بە ڕاستی گرنگن.
**brassware** (bras′wâr′, bräs′wâr′), *n.* دەفری مسین؛ ئامێرو شتی مسین
**brass winds,** ئامێری مۆسیقایی فووپیاکردنی مسین.
**brassy** (bras′i, bräs′i), *adj.* (١) مسین؛ وەك مس؛ مس لێدراو؛ مس. (٢) بریقەدارو هەرزانبەها. (٣) بێ حەیا؛ بێ شەرم. (٤) دەنگ زل.
*n.* داری سەرمسی یاری گۆلف.
**brat** (brat), *n.* منداڵێکی بێ حەیاو هاروهاج؛ منداڵێکی چەقاوەسوو.
**brattice** (brat′is), *n.* (١) دیوار یا شوورەی سەردەمی (ئابلوقەدان). (٢) تیغە دیوارێکی تەختە یا قوماشە بۆ هەوا گۆڕین لەناو کانگەیەکدا.
*v.t.* تیغە دیوار بۆ کردن
**bravado** (brə-vä′dō, brə-vā′dō), *n.* لافی ئازایی؛ هاشەوگوشە؛ فشە؛ ئازایی یا دلێری ڕووکەش.
**brave** (brāv), *adj.* (١) ئازا؛ قارەمان؛ دلێر؛ نەبەرد؛ چاونەترس. (٢) جوان؛ ڕەنگین؛ دیمەنی جوان (٣) [Archaic]، نایاب؛ زۆرباش.
*n.* (١) پیاوێکی ئازا؛ کەسێکی نەبەرد، دلێر، قارەمان، بەجەرگ... هتد. (٢) جەنگاوەرێکی هیندی ئەمەریکایی. (٣) [Archaic]، سینەبەندی؛ شەلاتی.
*v.t.* وێران؛ بەربەرەکانی کردن؛ بە ئازایانە بەرەوڕووبوونەوە و دەربڕدن: (*He had ~d death a hundred times. ; We decided to ~ the storm.)*
*v.i.* [Obs.], فشەکردن؛ خۆهەڵکێشان.
-**bravely** *(adv.)*; **braveness** *(n.)*.
**brave it out,** شان دانەبەرو دەربردن (ناخۆشی یا هێرش).
**bravery** (brāv′ēr-i), *n.* (١) ئازایەتی؛ قارەمانی؛ چاونەترسان. (٢) جوانی و ڕەنگینی (جل وبەرگ، نواندن، دیمەن).
**bravo** (brä′vō), *interj.* ئافەرم!؛ ئافەرین!؛ دەست خۆش!؛ هەر بژیت!.
**bravo** (brä′vō, brā′vō), *n.* پیاوکوژێکی بە کرێ گیراو؛ ڕەش کوژ.
**bravura** (brə-vyoor′ə), *n.* (١) کارێکی ئازایانەو لێهاتووانە؛ ئازایی. (٢) شێوازێکی ڕازاوەو ڕەنگین. (٣) پارچەیەك مۆسیقای باش و لێهاتووانە.
**braw** (brô, brä), *adj.* [Scot.], (١) جوان پۆش؛ پۆشتە. (٢) نایاب.
**brawl** (brôl), *v.i.* (١) شەڕو هەرا کردن؛ شەڕەشەق کردن؛ شەڕکردن. (٢) خوڕەهاتن (وەك ئاوی ڕووبار بەسەر قەڵبەزە یا خوڕاودا).
*n.* (١) شەڕو هەرا؛ شەڕەشەق؛ شەڕ؛ هەراوزەنا. (٢) [Slang]، ئاهەنگێکی دەنگ بەرز.
**brawl** (brôl), *n.* (١) سەمایەکی لادێیانەی کۆنی فەرەنسییە. (٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**brawn** (brôn), *n.* (١) ماسولکە؛ ماسولکەی گەورەو بەهێز. (٢) هێزی ماسولکە؛ هێزی لەش. (٣) گۆشتی کوڵاوی یەکانە.
**brawny** (brôn′i), *adj.* ماسولکەدار؛ بەهێز.
-**brawniness** *(n.)*.
**braxy** (brak′si), *n.* نەخۆشی ڕیخۆڵەی مەڕ.
**bray** (brā), *v.i.* زەڕین (کەر).
*v.t.* زەڕین؛ بەتوندی هاوارکردن.
*n.* زەڕە؛ زەڕین.
**bray** (brā), *v.t.* (١) هاڕین؛ ووردکردن. (٢) مەرەکەب بەسەردا بڵاوکردنەوە.
**brayer** (brā′ēr), *n.* ئامێری مەرەکەب بڵاوکەرەوە (چاپەمەنی).
**braze** (brāz), *v.t.* لەحیم کردن بە مس.
**braze** (brāz), *v.t.* (١) لە مس دروستکردن؛ لە مس گرتن. (٢) وەك مس لێکردن لە سەختیدا.
**brazen** (brā′z'n), *adj.* (١) مسین؛ لە مس دروستکراو. (٢) زەردو ڕەق وەك مس. (٣) ڕووهەڵماڵراو؛ بێ حەیا؛ بێ شەرم. (٤) ئاساز (دەنگ).
*v.t.* ڕووهەڵماڵین؛ بێ حەیاو بێ شەرم کردن.
-**brazenly** *(adv.)*.
**brazenfaced** (brā′z'n-fāst′), *adj.* ڕووهەڵماڵراو؛ بێ حەیاو شەرم.
**brazier** (brā′zhēr), *n.* کوورە؛ مقەڵی.
**brazier** (brā′zhēr), *n.* مسگەر.
**Brazil nut,** گوێزی بەرازیلی (کە زۆر چەورە).
**brazilwood** (brə-zil′wood′), *n.* داری بەرازیلی: داری سووری درەختێکی ئەمەریکای خوارووە کە بۆیەی لێ دەردەهێنرێت.
**breach** (brēch), *n.* (١) شکان؛ شکاندن. (٢) پەیمان شکاندن. (٣) کەلەبەر؛ درز؛ کون. (٤) شەپۆل شکانەوە. (٥) شەپۆلی وەها. (٦) بازددانی نەهەنگ بۆ سەرئاو. (٧) ئاش‌وماش؛ پچڕانی برادەرێتی. (٨) قۆڕی؛ برین.
*v.t.* (١) کەلەبەرتێکردن؛ کون تێکردن؛ برین (دیوار)؛ شکاندن. (٢) شکاندن (پەیمان، ڕێکەوتن): *(to ~ an agreement)*.
*v.i.* بازددانە سەرەوەی ئاو (نەهەنگ).
**breach of faith,** پەیمان شکاندن.
**breach of promise,** پەیمان شکاندن (شووکردن و ژنهێنان).
**breach of the peace,** ئاسایش تێکدان؛ ئاژاوە نانەوە.
**bread** (bred), *n.* (١) نان. (٢) خواردەمەنی؛ خواردن؛ نان.

(۳) بژێو؛ نان: *( He earns his ~ .)* .
(٤) [Slang]، پوول‌وپاره؛ پاره؛ دراو.
***v.t.*** به پرزۆڵه‌نان داپۆشین (چێشت لێنان).
**bread and butter,** (۱) نان‌و که‌ره. (۲) گوزه‌ران؛ ده‌رامه‌ت؛ هۆی ژیان.
**break bread,** (۱) نان خواردن؛ نان پێکه‌وه خواردن.
(۲) به‌شداری شێوی پیرۆز بوون (خاچ په‌رستی).
**cast one's bread upon the waters,** چاکه‌کردن‌و دانی به ده‌م ئاوه‌وه؛ نان دان به خه‌ڵك؛ دڵفراوانی کردن.
**know which side one's bread on,** چاکه‌ی خۆ زانین؛ سوودی خۆ زانین
**take the bread out of (a person's) mouth,** پاروو له ده‌م ده‌رهێنان؛ ده‌رامه‌ت لێسه‌ندنه‌وه؛ مایه‌ی ژیان لێ برین.
**bread-and-butter** (bred′′n-but′ēr), ***adj.*** (۱) گه‌نج؛ منداڵ؛ هه‌رزه؛ ساوێلکه. (۲) ساده؛ ساکار؛ ره‌شۆکی.
(۳) هۆی ژیانه؛ پێ‌ی ده‌ژی؛ هه‌میشه‌یی: *( a ~ job)* .
(٤) له‌رووی سوپاسه‌کردنه‌وه‌یه؛ سوپاسنامه: *[ a ~ note (or letter) ]* .
**breadbasket** (bred′bas′kit, bred′bäs′kit), ***n.*** (۱) زه‌مبیله‌ی نان. (۲) ناوچه‌ی سه‌ره‌کی به‌رهه‌م هێنه‌ری دانه‌وێڵه.
(۳) [Slang]، سك؛ گه‌ده. (٤) [Slang]، بۆمبا.
**breadboard** (bred′bôrd′, bred′bōrd′), ***n.*** (۱) ته‌خته‌ی هه‌ویر شێلان‌و نان کردن؛ پنه. (۲) ته‌خته‌ی نان برین.
**bread crumb,** پرزۆڵه‌نان؛ ووردەنان؛ په‌نچك
**breadfruit** (bred′frōōt′), ***n.*** (۱) میوه‌ی نان؛ میوه‌یه‌کی گه‌وره‌ی گۆشتنه که پیشێنرا تامی نان ده‌دات. (۲) دره‌ختی ئه‌م میوه‌یه.
**bread line,** ریزی خه‌ڵکی وه‌ستاو بۆ نان، واته خوارده‌مه‌نی مفت؛ ریزه خه‌ڵکی بێ ده‌رامه‌ت.
**breadstuff** (bred′stuf′), ***n.*** (۱) نارد. (۲) نان
**breadth** (bredth), ***n.*** (۱) پانی؛ پانایی
(۲) پارچه‌یه‌ك شت که پانتایی‌یه‌کی تایبه‌تی هه‌بێت: *( a ~ of canvas)* .
(۳) زلی؛ گه‌وره‌یی؛ مه‌ودا؛ زۆرو زل؛ راده.
(٤) فراوانی (مێشك، تێگه‌یشتن)؛ کراوه‌یی:
*( ~ of mind, sympathy, understanding, interests, etc.)*
**breadthways** (bredth′wāz′), ***adv.*** به پانی؛ له باری پانی.
**breadthwise** (bredth′wīz′), ***adv.*** = breadthways.
**breadwinner** (bred′win′ēr), ***n.*** نان په‌یداکه‌ر (بۆ که‌س‌وکار)؛ خێزان به‌خێوکه‌ر؛ بژێوی په‌یداکه‌ر: *( the ~ of the family)* .
**break** (brāk), ***v.t.*** (۱) شکاندن؛ پارچه‌پارچه‌کردن
(۲) کون تێکردن (پێست، زه‌وی).
(۳) دوایی پێ هێنان؛ شکاندن:
*( to ~ a strike ; The strike was broken.)*
(٤) له‌کارخستن؛ شکاندن؛ سه‌قه‌ت کردن.
(۵) شکاندن (پله؛ پله‌وپایه نزم کردنه‌وه.
(٦) نابووت کردن. (۷) مل پێ شۆڕکردن؛ هێنانه ژێرباره‌وه.
(۸) کون کردن؛ به زۆر چوونه ژووره‌وه.
(۹) شکاندن (په‌یمان، یاسا) *( to ~ an agreement, the law, etc.)* .
(۱۰) ده‌ربازبوون؛ راکردن (به‌ندیخانه): *( They cannot ~ prison.)* .
(۱۱) شکاندنی پله‌ی ئه‌وپه‌ڕ: *( to ~ a record)* .
(۱۲) په‌ت پچڕاندن؛ ریز تێکدان
*( The troops broke formation and ran.)*
(۱۳) برین (ته‌ووژمی کاره‌با، گه‌شت): *( to ~ a circuit)* .
(۱٤) برین (بێ ده‌نگی): *( to ~ the silence)*
(۱۵) که‌مکردنه‌وه‌ی کاریگه‌ری یا ئه‌نجامی خراپ
(۱٦) ئاشکراکردن؛ درکاندن؛ ده‌ربڕین: *( He broke the news to us.)* .
(۱۷) ده‌ستپێکردن.
(۱۸) ووردکردنه‌وه (پاره): *( ~ a dollar)* .
(۱۹) هێنانه به‌ربار؛ راهێنان؛ گرتن (جووانووه ئه‌سپ): *( to ~ a horse)* .
(۲۰) ته‌رك کردن؛ وازلێهێنان (خوو): *( ~ a habit)* .
(۲۱) دڵ شکاندن؛ زۆر خه‌فه‌تبارکردن: *( She broke his heart.)*
(۲۲) چاره دۆزینه‌وه؛ لێکدانه‌وه.
***v.i.*** (۱) شکان؛ پارچه‌پارچه‌بوون؛ شه‌ق بردن.
(۲) بڵاوه‌لێکردن: *( Let's ~ and run.)* .
(۳) ( **~ up ; ~ with** )، ئاش‌وماش کردن؛ په‌یوه‌ندی برین.
(٤) له‌کارکه‌وتن؛ شکان (مه‌کینه). (۵) نابووت بوون.
(٦) گۆڕان (ده‌نگ)؛ شکان: *( His voice broke.)* .
(۷) له‌پڕ راکردن؛ هه‌ڵاتن؛ بەله‌سه‌بوون. (۸) پسان؛ هه‌ره‌س بردن؛ رووخان.
(۹) هه‌ڵوه‌شان؛ داڕزان. (۱۰) جه‌رگ بڕان؛ دڵ شکان.
(۱۱) دوایی هاتن؛ ته‌واوبوون:
*( The game will ~ up in ten minutes.)*
(۱۲) شکان (نرخ). (۱۳) شکانه‌وه (شه‌پۆل).
(۱٤) ( **~ into ; ~ out in** )، له‌پڕ ده‌ستپێکردن یا هاتنه قسه، گۆرانی، پێکه‌نین: *( He broke into song, laughter, etc.)* .
(۱۵) ده‌رکه‌وتن؛ په‌یدابوون؛ رۆژبوونه‌وه:
*[ Day was ~ing. ; The story (or news) broke. ]*
(۱٦) له‌پڕ سه‌ر هێنانه ده‌ره‌وه له ئاو (ماسی، نه‌هه‌نگ).
(۱۷) [Colloq.]، روودان: *( Things were ~ing badly.)* .
***n.*** (۱) شکان؛ پارچه‌پارچه‌بوون؛ شه‌ق بردن؛ درزبردن؛ لێك ترازان.
(۲) شکاوی؛ درز؛ که‌له‌به‌ر؛ بۆشایی؛ کون.
(۳) سه‌ره‌تا؛ سه‌رده‌رهێنان: *( the ~ of day)* .
(٤) برین (ماڵ). (۵) پچڕان؛ وه‌ستان.
(٦) پشوو؛ حه‌وانه‌وه: *( to take a ~ )* .
(۷) پچڕان (په‌یوه‌ندی): *( a ~ in relations, ties, etc.)* .
(۸) بڕان (ته‌ووژمی کاره‌با)؛ پچڕان.
(۹) بووار؛ هه‌ل؛ گۆڕین: *( a ~ in the weather)* .
(۱۰) ده‌رپه‌ڕین؛ له‌پڕ راکردن.
(۱۱) (*pl.*)، چه‌ند خاڵێکی وه‌ك ئه‌مانه ..... (چاپه‌مه‌نی، خاڵبه‌ندی).
(۱۲) شکان (نرخ). (۱۳) ناته‌واوی؛ که‌م‌وکووڕی.
(۱٤) [Colloq.]، کردارێك یا ووته‌یه‌کی نابه‌جێ.
(۱۵) [Slang]، هه‌ل؛ به‌خته‌وه‌ری‌یه‌کی رێکه‌وت:
*( He gave me a ~ . ; He got a ~ in his business.)*
**break away,** (۱) راکردن؛ ده‌ربازبوون؛ به‌ره‌ڵابوون؛ هه‌ڵاتن.
(۲) جیابوونه‌وه. (۳) زوو ده‌ستپێکردن، واته له‌پێش کاتی خۆیدا (پێشبڕکێ)
**break bread,** نان خواردن؛ پێکه‌وه نان خواردن.
**break down,** (۱) شکان؛ له‌کارکه‌وتن؛ په‌ککه‌وتن:
*( My car broke down on the highway.)*
(۲) ده‌ست کردن به گریان.
(۳) به‌لاداهاتن؛ هه‌ره‌س بردن (مرۆڤ)؛ تێکشکان (له‌ش یا مێشك)؛ که‌وتن
(٤) شکاندن (دوژمن)؛ به‌زاندن؛ به‌سه‌ردا زاڵبوون.
(۵) شیکردنه‌وه؛ جیاکردنه‌وه؛ به‌ش به‌ش کردن؛ پۆل پۆل کردن.
(٦) به‌ره‌و خراپی رۆیشتن؛ دانه دواوه:
*( Relations began to break down.)*
**break in,** (۱) برین (ماڵ)؛ به زۆر چوونه ژووره‌وه؛ له‌پڕ چوونه ژووره‌وه.
(۲) قسه پێ برین.
(۳) (ا) گرتن (جووانووه ئه‌سپ، ماین)؛ هێنانه به‌ربار؛ راهێنان؛ فێرکردن:
*( to break in a young horse, new worker, etc.)*
(ب) پێ راهاتن: *( to break in a new pair of shoes)* .
**break in on (or upon),** (۱) خۆ سه‌پاندن به‌سه‌ردا؛ خۆتێهه‌ڵقورتان؛ هه‌ڵدان. (۲) قسه پێ برین.
**break into,** (۱) برین (ماڵ)؛ چوونه ژووره‌وه (به زۆر، له‌پڕ، به‌دزی‌یه‌وه، یا به ناڕه‌وایی): *( They broke into the house.)* .
(۲) قسه پێ برین؛ پێ برین (قسه، بیر).

(٣) لەپڕ هاتنە قسە، پێکەنین، گریان، یا خوێندنەوە.

**break of,** واز پێ هێنان (خوو)؛ پێ تەرك كردن.

**break off,** (١) برین (قسە)؛ لەپڕ وەستان (قسە، کار).

(٢) پەیوەندی برین؛ پچڕاندن (برادەرێتی، دڵداری)؛ بڕینەوە (دۆستایەتی):

*( The two lovers broke off last week.)*

**break out,** (١) هەڵگیرسان (شەڕ، ئاگر)؛ بەرپابوون:

*( A riot broke out. ; War broke out between the two sides.)*

(٢) ڕاکردن (لە بەندیخانە)؛ هەڵاتن؛ برین و دەربازبوون (بەندیخانە).

(٣) دەردان (زیپکە، دوومەڵ): *( The child broke out in a rash.)* .

(٤) لەنگەر شل کردن و هەڵکردن (بۆ ڕۆیشتنی کەشتی).

**break up,** (١) بڵاوەپێکردن؛ وەستاندن؛ دوایی پێ هێنان:

*( to break up a demonstration, meeting, etc.)*

(٢) هەڵوەشاندن؛ پارچەپارچەکردن؛ جیاکردنەوە لەیەك.

(٣) پەرش و بڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ بڵاوبوونەوە.

(٤) بڕانەوە (دۆستایەتی)؛ دوایی پێ هێنان (پەیوەندی):

*( The two lovers broke up suddenly.)*

(٥) [Colloq.]. وورە بەردان.

(٦) [Slang]، مردن لە پێکەنیندا؛ سك ژان کردن لە پێکەنیندا:

*( They broke up laughing.)*

**break wind,** تڕکەندن.

**break with,** (١) پەیوەندی لەگەڵ برین یا پچڕان؛ ئاشت و ماش کردن.

(٢) شوێن نەکەوتن؛ لێ دابڕان یا جیابوونەوە؛ لەگەڵدا نەگونجان و جیابوونەوە:

*( to break with tradition)*

**break** (brāk), *n. Also* brake, چوارچێوەی عەرەبانە (بۆ گرتن یا هێنانە ژێر بارەوەی جووانووە ئەسپ).

**breakable** (brāk'ə-b'l), *adj.* بەئاسانی دەشکێت؛ ناسك.

*n.* شتێکی ناسك؛ شتێکی بەئاسانی شکاو.

**breakage** (brāk'ij), *n.* (١) شکاندن؛ شکێنران؛ شکان؛ شکاوی.

(٢) شتی شکاو؛ ئەوەندەی کە شکاوە. (٣) زیان بەهۆی شکانەوە.

(٤) بژاردنی شکان

**breakbone fever,** = dengue.

**breakdown** (brāk'doun'), *n.* (١) شکان (مەکینە، ئامێر)؛ لەکارکەوتن؛ پەککەوتن.

(٢) ڕووخان (تەندروستی)؛ مێشك تێکچوون؛ هەرەس بردن (لەش، مێشك):

*( He had a nervous ~ .)*

(٣) پێش نەکەوتن و وەستان (گفتوگۆ)؛ ڕووخان؛ دوایی هاتن بە ژێرکەوتن:

*( a ~ of negotiations)*

(٤) شیبوونەوە؛ لێکبوونەوە؛ جیابوونەوە؛ هەڵوەشان:

*( a ~ of food during digestion)*

(٥) شیکرانەوە؛ شیکردنەوە.

(٦) پۆل پۆل کردن. (٧) جۆرە سەمایەکی پڕ جۆشە.

**breaker** (brāk'ẽr), *n.* (١) شکێن (مرۆڤ، شت)؛ شکێنەر.

(٢) مەکینە یا کارگەی شکێن (بۆ بەرد یا خەڵووزی بەرد).

(٣) شەپۆلێکە کە دەشکێتەوە بەسەر کەناری دەریادا و کەفی لێ هەڵدەستێت.

(٤) circuit breaker .

**breaker** (brāk'ẽr), *n.* بەرمیلێکی بچووکی ئاو لە بەلەمدا.

**breakfast** (brek'fəst), *n.* بەرچایی ' نانی بەرچایی؛ نانی بەیانی؛ بەرقلیان

*v.i.* بەرچایی خواردن؛ نانی بەیانی خواردن.

*v.t.* بەرچایی پێدان؛ ناشتایی پێدان؛ نانی بەیانی پێدان.

**breakin** (brāk'in'), *n.* ماڵ بڕین؛ چوونە ناوماڵ بە زۆر یا بەدزییەوە.

**breakneck** (brāk'nek'), *adj.* مل شکێنەر؛ پڕ مەترسی:

*( ~ speed)*

**break of day,** بەرەبەیان

**breakout** (brāk'out'), *n.* برین یا شکاندن و دەربازبوون:

*( a prison ~ )*

**breakthrough** (brāk'thrōō'), *n.* (١) برین (کۆسپ)؛ سمین؛ پێدا تێپەڕبوون. (٢) شکاندنی هێزی بەرهەڵستی دوژمن؛ برین و پێدا چوونە ژوورەوەی هێڵی بەرهەڵستی دوژمن.

(٣) پێشکەوتنێکی گرنگ و کوتوپڕ (زانست، تەکنۆلۆجیا، پزیشکەوانی، گفتوگۆ)؛ بەرهەم هێنان یا دۆزینەوەیەکی سەرەکی:

*( a major ~ in science and technology)*

**breakup** (brāk'up'), *n.* (١) بڵاوبوونەوە؛ بڵاوەلێکردن.

(٢) شیبوونەوە؛ هەڵوەشان؛ لێکبوونەوە؛ داڕزین. (٣) وورە بەردان؛ ڕووخان.

(٤) دوایی هاتن

**breakwater** (brāk'wô'tẽr, brāk'wot'ẽr), *n.* شەپۆل شکێن؛ بەربەستی شەپۆل: دیوارێکە بۆ بەربەست کردنی شەپۆلی دەریا و پاراستنی بەندەرو کەناری دەریا.

**bream** (brēm), *n.* (١) ماسییەکی ناو ڕووباری ئەورووپایییە.

(٢) ماسییەکی ناو دەریایە.

**bream** (brēm), *v.t.* پاکردنەوەی بنی کەشتی

**breast** (brest), *n.* (١) مەمك. (٢) سنگ؛ سینە؛ بەرسنگ.

(٣) سنگ یا بەرسنگی گیاندار. (٤) سەرچاوەی بژێوی.

(٥) بەرسنگی جل وبەرگ. (٦) سەرچاوەی هەست؛ دڵ و دەروون؛ سۆز.

(٧) بەشێکی لە سنگ چوو؛ پێشەوە؛ بەرسنگ: *( the ~ of a hill)* .

*v.t.* (١) بەرەوڕوو وەستان؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەرەنگاربوون.

(٢) سنگ دانە بەر؛ بۆ پێشەوە ڕۆیشتن.

**make a clean breast of,** دان بە تاواندا نان؛ پێ لە تاوان نان.

**breastbone** (brest'bōn'), *n.* کۆڵەی سنگ؛ ئێسقانی سنگ.

**breast-feed** (brest'fēd'), *v.t.* مەمك پێدان؛ شیرپێدان (منداڵ).

**breastpin** (brest'pin'), *n.* یەخەبەند؛ گوڵی سینە.

**breastplate** (brest'plāt'), *n.* (١) قەڵغانی سنگ؛ بەرۆك؛ سینەزری.

(٢) پارچەیەك قوماشی نەخش ونیگاراوی بە گەوهەر ڕازاوەیە سەرەك مالووم لە کۆندا دەیکرد بە بەرسنگییەوە. (٣) قاوغی بەرسنگی کیسەڵ.

(٤) سینەبەندی ئەسپ (کە بەشێکە لە زین).

**breast stroke,** بۆقە مەلە.

**breastwork** (brest'wûrk'), *n.* سەنگەرێکی سەردەمییە بە بەرزایی سنگ.

**breath** (breth), *n.* (١) هەناسە. (٢) هەناسەدان. (٣) بۆنی دەم.

(٤) توانای هەناسەدان. (٥) ژیان؛ گیان. (٦) کزەبا؛ شنە؛ سروە

(٧) ئەنجامی هەناسە (وەك تەمی سەر ئاوێنە). (٨) چرپە.

(٩) هەناسە (کات)؛ چرکە. (١٠) پشوو؛ وەستانێکی کورت.

**below one's breath,** بە چرپە؛ بە ئەسپایی.

**catch one's breath,** وەستان و پشوودان بۆ هەناسە هاتنەوەبەر (پاش هەناسەبڕکێ).

**hold one's breath,** چاوەڕێ کردن بە ترس و پەرۆشەوە (دەنگوباس).

**in the same breath,** لە هەمان کاتدا؛ لە هەمان سات یا هەناسەدا.

**out of breath,** هەناسە لێ بڕان؛ هەناسە پێ نەمان.

**save one's breath,** قسەی خۆ بە با نەدان.

**take one's breath away,** موورچرکە بە لەشدا هێنان یا هەناسە برین لە خۆشی و سەرسامیدا:

*( The view from the airplane takes your breath away.)*

**under one's breath,** بە چرپە؛ بە ئەسپایی

**breathe** (brēth), *v.i. & v.t.* (١) هەناسەدان. (٢) هەناسە وەرگرتن.

(٣) هەناسە دانەوە. (٤) ژیان.

(٥) بۆن هاتن؛ بۆن لێهاتن. (٦) هەڵکردن بە هێواشی (با).

(٧) چرپەهاتن؛ چرپەکردن. (٨) پشوودان؛ پشوو پێدان.

(٩) ( ~ hard )، هەناسەبڕکێ بوون.

**breathe again (or freely),** دڵ ڕەحەت بوون.

**breathe one's last,** مردن؛ دوا هەناسە دان.

**not breathe a word,** دەم نەکردنەوە؛ هیچ نەوتن؛ هیچ قسە نەکردن.
**breather** (brē*th*′ẽr), ***n.*** (١) کەسێك کە بە جۆرێکی تایبەتی هەناسە
دەدات *( a mouth ~ )*.
(٢) [Colloq.]، هۆی هەناسەبڕکێ (وەرزش، کار).
(٣) [Colloq.]. پشوو (بۆ هەناسە هاتنەوەبەر).
**breathing** (brē*th*′iŋ), ***adj.*** زیندوو.
***n.*** (١) هەناسەدان. (٢) هەناسەیەك؛ هەناسەدانێك.
(٣) چرکە؛ هەناسە (کات).
(٤) سروە؛ شنە؛ کزەبا. (٥) ووتە؛ وورتە.
(٦) دەنگی وەك تیپی " h " لە ئینگلیزیدا، واتە " هێ "
**breathing space,** (١) شوێن و کاتی کارکردن و جوولانەوە بە
سەربەستی (٢) پشوو؛ بووار (بۆ پشوودان یا لێکۆڵینەوە).
**breathless** (breth′lis), ***adj.*** (١) هەناسە لێ براو؛ مردوو.
(٢) هەناسەبڕکێ پێکەوتوو. (٣) هەناسە سواربوو (لە خۆشی یا ترسدا).
(٤) کپ؛ بێ سروە؛ بێ با.
**breath-taking** (breth′tāk′iŋ), ***adj.*** هەناسە سوارکەر (لە جوانی
یا خۆشیدا)؛ زۆر جوان و خۆش:
***( a ~ view of the ocean, mountain, valley, city, etc.)***
**breathy** (breth′i), ***adj.*** هەناسەیی (دەنگ، قسە)؛ هەناسە لەگەڵ.
**breccia** (brech′i-ə, bresh′i-ə), ***n.*** بریشیە: بەردێکە لە تەڵەزمی
گۆشەتیژی ئاگرپژێنی بە لم یا گەچ پێکەوەنووساو پێکهاتووە.
**bred** (bred), *past tense and p.p. of* **breed.**
**brede** (brēd), ***n.*** [Archaic], = **braid.**
**breech** (brēch), ***n.*** (١) سمت؛ گووپی سمت؛ قنگ؛ گووپی قنگ.
(٢) بن؛ ژێر؛ لاخوارووی خولخولۆکە. (٣) قۆناغە تفەنگ.
***v.t.*** (١) پانتۆڵی کورت لەبەرکردن. (٢) قۆناغ بۆ کردن (تفەنگ).
**breechblock** (brēch′blok′), ***n.*** دەمەوانەی قۆناغی هەندێك تفەنگ.
**breechcloth** (brēch′klôth′, brēch′kloth′), ***n.*** پەشتەماڵێکی
کورت.
**breechclout** (brēch′klout′), ***n.*** = **breechcloth.**
**breeches** (brich′iz), ***n.pl.*** (١) پانتۆڵی کورت (هەتا ئەژنۆ).
(٢) [Colloq.]، پانتۆڵ.
**breeches buoy,** پانتۆڵی ڕزگارکردن (لە خنکاندن لەناو دەریادا):
کە لە کەشتی‌یەکەوە بۆ کەسەکە شۆڕ دەکرێتەوە.
**breeching** (brich′iŋ, brēch′iŋ), ***n.*** (١) پالوو (کۆپان، زین).
(٢) قۆناغە تفەنگ
**breed** (brēd), ***v.t.*** (١) بوون (منداڵ، بەچکە)؛ هەڵهێنان؛ سك‌وزاکردن.
(٢) بوون بە هۆ؛ لێ پەیدابوون؛ لێ بوونەوە ***( Ignorance ~s prejudice.)*** .
(٣) (ا) زاوزێ پێکردن؛ بەخێوکردن؛ پەروەردەکردن:
***( He ~s dogs, horses, etc.)***
(ب) لێ چاك کردن.
(٤) ئامادەکردن؛ پەروەردەکردن بۆ؛ فێرکردن و ڕاهێنان بۆ مەبەستی تایبەتی.
***v.i.*** (١) پەیدابوون؛ پەرەسەندن: ***( Crime ~s in slums.)*** .
(٢) بوون (منداڵ، بەچکە)؛ زاوزێ کردن.
***n.*** (١) توخم (گیاندار، ڕووەك)؛ ڕەگەز: ***( There are many ~s of dogs.)*** .
(٢) جۆر؛ چەشن ***( men of the same ~ )***
**breeder** (brēd′ẽr), ***n.*** (١) گیانداری زاوزێ کەر؛ ڕووەکێك کە ڕووەکی
تری لێ دەبێتەوە. (٢) زاوزێ پێکەر؛ پەروەردەکەری گیاندار و ڕووەك.
(٣) هۆ؛ سەرچاوە؛ داهێنەر.
**breeding** (brēd′iŋ), ***n.*** (١) زاوزێ کردن؛ بوون (منداڵ، بەچکە).
(٢) منداڵ یا بەچکە پەروەردەکردن.
(٣) ڕەسەنی؛ ڕەووشت جوانی؛ پەروەردەی جوان و چاك:
***( Tolerance is a sign of ~ .)***
(٤) زاوزێ پێکردن بۆ توخم باشترکردن (گیاندار، ڕووەك).
**breeze** (brēz), ***n.*** (١) سروە؛ شنە؛ کزەبا؛ شنەبا؛ سۆزە.
(٢) [British]، پشێوی؛ مشت‌ومڕ؛ هەراهەرا.
(٣) [Colloq.]، کارێکی ئاسان: ***( That job was a ~ .)*** .
***v.i.*** (١) هەڵکردن (سروە).
(٢) [Slang]، بە تیژی و بێباکانە و کەیف قنجی‌یەوە ڕۆیشتن بەڕێوە.
**breeze** (brēz), ***n.*** [Rare], خەرمگێز.
**breeze** (brēz), ***n.*** [British], خڵتە و سەرکۆزەری خەڵووزی بەردین.
**breezily** (brēz′′l-i), ***adv.*** بە خێرایی و بێباکی و کەیف قنجی‌یەوە
(ڕۆیشتن).
**breezy** (brēz′i), ***adj.*** (١) سروەدار؛ بە شنە؛ کزەبایەکی خۆشی هەیە:
*( a ~ day)*
(٢) بێباك و کەیف قنج؛ زیت؛ گورج‌وگۆڵ: ***( He has a ~ manner.)*** .
-breeziness *(n.).*
**bregma** (breg′mə), ***n.*** جەمسەری ئێسکی پێشەوە و لاتەنیشتی
کاسەی سەر.
**brethren** (bre*th*′rin, bre*th*′rən), ***n.pl.*** [Archaic], *plural of*
**brother.**
**Breton** (bret′′n), ***adj.*** بریتەنی: تایبەتی بە زمان و دانیشتووانی
" بریتەنی " کە ناوچەیەکە لە ڕۆژئاوای فەرەنسا.
***n.*** (١) هاوولاتی‌یەکی " بریتەنی " . (٢) زمانی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە.
(٣) شەپقەیەکی ژنانەی لێوار هەڵگەڕاوەیە.
**breve** (brēv), ***n.*** (١) نامەیەکی گرنگ (بەتایبەتی لە پاپا یا پاشاوە).
(٢) ئەم نیشانەیە ( ˘ ) کە دەخرێتە سەر تیپە بزوێنێك بۆ دەنگ کورتی.
(٣) هەمان نیشانەیە لەسەر بڕگەیەکی بێ دەنگ یا کورتکراوە.
(٤) نۆتەیەکی مۆسیقی‌یە کە بریتی‌یە لە دوو نۆتە.
(٥) فەرماننامە (دادگا)؛ کورتەی داوایەك.
**brevet** (brə-vet′, brev′it), ***n. & v.t.*** پلە بەرزکردنەوەی ئەفسەرێك
بەبێ زیادکردنی مووچەکەی.
**brevetcy** (brə-vet′si), ***n.*** پلەیەکی شانازنامەیی.
**brevi-** (brev′i), پێشگرێکە بەمانای: کورت.
**breviary** (brē′vi-er′i, brev′i-er′i), ***n.*** پەڕتووکی سروودی
ئاینی و نزای ڕۆژانە (ئاینی کاسۆلیکی و کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی).
**brevier** (brə-vêr′), ***n.*** جۆرە تیپێکە (چاپەمەنی):
( This line is in ~ .)
**brevity** (brev′ə-ti), ***n.*** (١) کورتی (کات).
(٢) کورتی و پڕ مانایی (ووتە، نووسراو).
**brew** (bro͞o), ***v.t.*** (١) بیرە درووستکردن (بە کوڵاندن و ترشان).
(٢) چالێنان؛ دەم کێشان (چا)؛ دەم پێ کێشان.
(٣) پێکهێنان و ڕێکخستن (پیلان)؛ پیلان گێڕان.
***v.i.*** (١) درووست بوون (بیرە)؛ دەم کێشان (چا).
(٢) خەریکی دەستپێکردن یا هەڵکردن بوون (گەردەلوول، گەرداو)؛ پەیدابوون؛
ئامادەکران و دەستپێکران (شەڕ، زریان): ***( A storm was ~ing.)*** .
***n.*** (١) خواردنەوەیەکی ترشێنراو یا لێنراو (بیرە، چا).
(٢) ئەو هەندەی کە بە یەك جار دەترشێنرێت یا لێدەنرێت.
**brewage** (bro͞o′ij), ***n.*** (١) خواردنەوەیەکی ترشێنراو (بیرە).
(٢) ترشاندن یا درووستکردن (بیرە).
**brewer** (bro͞o′ẽr), ***n.*** بیرە درووستکەر.
**brewery** (bro͞o′ẽr-i), ***n.*** کارگەی بیرە؛ کوڵێنگە (بیرە).
**brewing** (bro͞o′iŋ), ***n.*** (١) ترشاندن یا درووستکردن (بیرە).
(٢) ئەوەندەی کە بە یەك جار درووست دەکرێت (بیرە).
**brewis** (bro͞o′is), ***n.*** [Dial.], (١) گۆشتاو. (٢) نان و گۆشتاو.
**briar** (brī′ẽr), ***n.*** = **brier.**
**briarroot** (brī′ẽr-ro͞ot′, brī′ẽr-root′), ***n.*** = **brierroot.**
**briarwood** (brī′ẽr-wood′), ***n.*** = **brierwood.**
**bribable** (brīb′ə-b′l), ***adj.*** بەرتیلی دەدرێتێ؛ بەرتیل دەخوات.
**bribe** (brīb), ***n.*** بەرتیل.

*v.t. & v.i.* بەرتیل پێدان؛ بەرتیل دان.

-briber *(n.)*.

**bribery** (brīb'ēr-i), *n.* بەرتیل خواردن؛ بەرتیل دان و وەرگرتن.

**bric-a-brac** (brik'ə-brak'), *n.* (١) شتی بچووك و بەنرخ و نایاب و کۆنەباوی هونەری جوان (کە لە ژوورێکدا بۆ جوانی دادەنرێت).
(٢) زرووزەنگینانە؛ شتی پازێنەرەوەی بازاڕی.

**brick** (brik), *n.* (١) خشت. (٢) شتێکی وەك خشت (لە ڕێك و پێکی و خشتەیی چوارچێوەکەیدا). (٣) [Colloq.]، پیاوێکی زۆرباش؛ کوڕی چاك.

*adj.* لە خشت دروستکراو؛ تایبەتی بە خشت؛ خشت.

*v.t.* (١) بە خشت کردن؛ لە خشت دروستکردن.
(٢) (~ up; ~ in)، بە خشت دەورگرتن، داپۆشین، گرتن، یا هەڵچنین.

make bricks without straw, کردنی شتێك بەبێ کەرەسەی پێویست.

**brickbat** (brik'bat'), *n.* (١) پارچە خشت (کە دەهاوێژرێت یا دەدرێت بە شتێکدا). (٢) پلار؛ لاپلار؛ ڕەخنەیەکی تیژو هەست بریندارکەر.

**brickklin** (brik'klin'), *n.* کوورەی خشت سوورکردنەوە.

**bricklayer** (brik'lā'ēr), *n.* خشتکار؛ وەستای خشتکاری.

**bricklaying** (brik'lā'iŋ), *n.* خشتکاری؛ خشتکاری کردن.

**brick-red** (brik'red'), *adj.* سوور وەك خشت

**brickwork** (brik'wūrk'), *n.* (١) شتی لە خشت دروستکراو.
(٢) bricklaying.

**brickyard** (brik'yärd'), *n.* کارگەی خشت؛ فرۆشگای خشت.

**bridal** (brīd''l), *n.* شایی.

*adj.* (١) بووکێنی؛ تایبەتی بە بووك.
(٢) تایبەتی بە شایی: هی بووك و زاوایەتی.

**bridal wreath,** دەوەنێکی گەڵا ڕەش و بریقاوە و گوڵ سپییە.

**bride** (brīd), *n.* بووك.

**bride** (brīd), *n.* قوڵفە یا گرێ (نەقشکاری).

**bridegroom** (brīd'grōōm', brīd'groom'), *n.* زاوا.

**bridesmaid** (brīdz'mād'), *n.* تاوەڵ بووك: کچێکە تاوەڵی بووکە لەکاتی مارەبڕین و شاییدا لەگەڵی دەبێت.

**bridewell** (brīd'wel, brīd'wəl), *n.* بەندیخانە (بۆ تاوانی بچووك).

**bridge** (brij), *n.* (١) پرد. (٢) شتێکی وەك پرد. (٣) ئێسقانەی لووت.
(٤) ئەو بەشەی چاویلکە کە دەکەوێتە سەر ئێسقانەی لووت.
(٥) تیرەیەکی بەردینە لە تەنکاوی قەراغ دەریادا.
(٦) سەکۆی لێوە ڕانانی کەشتی.
(٧) ئەو شوێنەی داری بلیاردی لەسەر دادەنرێت لەکاتی یاری کردندا تاکو نەجووڵێتەوە لە مشت گرتنەوەدا لە تۆپەکان کە بریتییە لە پارچە دارێك یا دەست. (٨) پرد (داسنازی).

*v.t.* (١) پرد بەسەردا دروستکردن؛ پرد لەنێواندا دروستکردن.
(٢) بەسەر پرددا پەڕینەوە.
(٣) پێکەیاندن؛ پڕکردنەوە (بۆشایی، جیاوازی، دووری):

*( to ~ the gap between the two generations)*

burn one's bridges (behind one), ڕێگەی گەڕانەوە یا کشانەوە لە خۆ برین

cross a bridge when one comes to it, خەمی گیروگرفتێك خواردن هەروەها چارەسەرکردنی پاش پەیدابوونی نەك لەپێشدا؛ بە خۆرایی سەری خۆ نەئێشاندن بە گیروگرفتی دواڕۆژەوە.

**bridge** (brij), *n.* بریج: جۆرە یارییەکی کاغەزە.

**bridgeboard** (brij'bôrd', brij'bōrd'), *n.* سنگی پێ پلیکانە: ئەو تەختە دانەدارەی ئەمسەرو ئەوسەری پێ پلیکانەی دارە کە پێ پلیکانەکانی لەسەر ڕاوەستاوە.

**bridgehead** (brij'hed'), *n.* سەری پرد: بنکەیەکە لەوبەری پرد یا ڕووبارێکدا لەناو خاکی دوژمندا بۆ داگیرکردنی شوێنی تر بەکاردەهێنرێت.

**bridgework** (brij'wūrk'), *n.* (١) پردکاری؛ پرد دروستکردن.
(٢) پردی ددان. (٣) دروستکردن و دانانی پردی ددان.

**bridle** (brī'd'l), *n.* (١) لغاو؛ سەرکەللە. (٢) شتێکی وەك لغاو.
(٣) شتی دابینکەر؛ جڵەو.

*v.t.* (١) لغاوکردن؛ لغاو کردنە دەم. (٢) دابینکردن؛ گرتنەوە؛ جڵەوگرتن.

*v.i.* (١) سەرکێشی کردن؛ لووت بەرز گرتن (لە تووڕەییدا یا بەتەوسەوە).
(٢) تووڕەبوون؛ گاڵتەپێهاتن.

**bridle hand,** دەستی لغاو گرتن؛ دەستی چەپ.

**bridle path,** ڕێچکەی سواری.

**Brie cheese,** بری: جۆرە پەنیرێکی نەرمی نەختێك سوێری فەرەنسییە.

**brief** (brēf), *adj.* (١) کورت؛ کەم خایەن. (٢) کورت و مانابەخش.

*n.* (١) کورتە؛ پوختە. (٢) پوختەی داوایەك (کە پارێزەر ئامادەی دەکات).
(٣) نامەی پاپا. (٤) *(pl.)*، دەرپێی کورتی تەسك.

*v.t.* (١) پوختەکردن؛ کورتکردنەوە.
(٢) [British]، پارێزەر گرتن؛ پارێزەر کردن بە نوێنەر.
(٣) [British]، پوختەی داوا بۆ ناردن یا پێدان.
(٤) ئاگادارکردن؛ پێ ووتن (دەنگوباس، پوختەی مەسەلە):

*( He ~ed the president on the situation.)*

hold a brief for, لەسەرکردنەوە؛ پشتگیری کردن؛ لایەنگری کردن.

in brief, بە کورتی؛ بە کورتییەکەی.

**briefcase** (brēf'kās'), *n.* جانتای دەست.

**briefless** (brēf'lis), *adj.* کەس نەی گرتووە بە پارێزەر:

*( a ~ lawyer)*

**briefs** (brēfs), *n.pl.* دەرپێی کورتی تەسك.

**brier** (brī'ēr), *n.* (١) گوڵەباخە کێویلە؛ شیلان.
(٢) لقێك یا پەلەیەك لەم گوڵەباخە کێویلە یا شیلانە.

**brier** (brī'ēr), *n.* (١) ڕووەکێکی خوارووی ئەورووپایە ڕەگەکەی دەکرێت بە سەبیل. (٢) ڕەگی ئەم ڕووەکە. (٣) سەبیلێك کە لەم ڕەگە دروستکرابێت.

**brierroot** (brī'ēr-rōōt', brī'ēr-root'), *n.* ڕەگی ڕووەکێکە دەکرێت بە سەبیل.

**brierwood** (brī'ēr-wood'), *n.* = brierroot.

**brigade** (bri-gād'), *n.* (١) هێز (سوپا)؛ تابوور.
(٢) دەستە؛ تاقم؛ پۆل: *( a fire ~ )*.

*v.t.* (١) تابوور پێکهێنان. (٢) هاوپۆل کردن؛ دەستەدەستەکردن.

**brigadier** (brig'ə-dêr'), *n.* فەرماندەی هێز؛ ئەفسەرێکی گەورە.

**brigadier general,** = brigadier.

**brigand** (brig'ənd), *n.* چەتە؛ جەردە.

**brigandage** (brig'ən-dij), *n.* چەتەیی؛ جەردەیی.

**brigandine** (brig'ən-dēn', brig'ən-dīn'), *n.* زرێی تەرەقەدار؛ زرێیەکی لە تەرەقە و ئەڵقە پێکهاتوو.

**brigantine** (brig'ən-tēn', brig'ən-tīn'), *n.* کەشتی بای دوو - تەوەرە.

**bright** (brīt), *adj.* (١) ڕووناك؛ ڕۆشن.
(٢) گەش؛ بریقەدار؛ ڕەنگاوڕەنگ: *( ~ colors)*.
(٣) دەم بە پێکەنین؛ ڕووخۆش؛ زیت؛ دڵشاد.
(٤) زیرەك؛ زرنگ. (٥) بەناوبانگ؛ ناودار.
(٦) ڕۆشن؛ بەهات؛ پڕ ئومێد: *( She has a ~ future.)*.

*adv.* بە ڕۆشنی یا گەشی.

-brightly *(adv.)*.

**brighten** (brīt''n), *v.t.* (١) ڕووناك کردنەوە؛ ڕۆشن کردنەوە.
(٢) ڕۆشن کردنەوە؛ خۆش کردن؛ شادمان کردن؛ دڵخۆش کردن.

*( You ~ed my day. ; These flowers ~ the room.)*

*v.i.* (١) ڕووناك بوونەوە: *( The sky is ~ing.)*.
(٢) دڵخۆش بوون؛ دڵ ڕۆشنکردنەوە.

**brightness** (brīt'nis), *n.* (١) ڕووناکی؛ ڕۆشنی؛ گەشی.
(٢) دڵخۆشی؛ خۆشی؛ شادی.

**Bright's disease,** = nephritis.

**brill** (bril), ***n.*** جۆرە ماسی‌یەکی پانی ئەورووپایی‌یە.
**brilliance** (bril′yəns), ***n.*** (١) درەوشانەوە؛ شەوقدانەوە.
(٢) شەوق؛ گەشی؛ ڕووناکی‌یەکی زۆر؛ ڕۆشنی؛ تریفە.
(٣) جوانی و نایابی. (٤) زۆر زیرەکی؛ بلیمەتی؛ زرنگی.
**brilliancy** (bril′yən-si), ***n.*** = **brilliance.**
**brilliant** (bril′yənt), ***adj.*** (١) درەوشاوە؛ شەوقدار؛ بریقەدار.
(٢) گەش؛ ڕووناك؛ ڕوون. (٣) جوان و نایاب. (٤) زۆر زیرەك؛ بلیمەت؛ زرنگ.
***n.*** (١) ئەلماسێکی درەوشاوە.
(٢) بڕینی گەوهەر بە جۆرێك کە بدرەوشێتەوە.
(٣) بچووکترین تیپ (چاپەمەنی).
**-brilliantly** ***(adv.).***
**brilliantine** (bril′yən-tēn′), ***n.*** (١) ڕۆنی سەر (بۆ بریقانەوەی قژ).
(٢) قوماشێکی ساف و لووس و بریقەدارە.
**brim** (brim), ***n.*** (١) لێو (پەرداخ، پیالە، کووپ... هتد)؛ لێوار.
(٢) بەست :هی قەراغ جۆگە و گۆماو).
(٣) قەراغ (شەپقە)؛ لێوار.
***v.t.*** بە تەواوی پڕکردن؛ لێوالێوکردن.
***v.i.*** لێوالێوبوون؛ زۆر پڕبوون.
**brimful, brimfull** (brim′fool′), ***adj.*** لێوالێو؛ زۆر پڕ.
**brimmer** (brim′ēr), ***n.*** کووپ، پەرداخ، پیالە، یا جامێکی پڕ.
**brimstone** (brim′stōn′), ***n.*** گۆگرد؛ کبریت
**brindle** (brin′d'l), ***adj.*** بازوو (ڕەنگ، گیاندار).
***n.*** (١) گیاندارێکی بازوو. (٢) ڕەنگێکی بازوو.
**brindled** (brin′d'ld), ***adj.*** بازوو (گیاندار)
**brine** (brīn), ***n.*** (١) سوێراو؛ خوێ ئاوگ.
(٢) هەندێکی زۆر ئاوی سوێر (وەك دەریا).
***v.t.*** سوێرکردن (بادەم، چەقالە)؛ گرتنەوە (ترشیات)؛ کردنەناو ئاوی سوێرەوە.
**bring** (briŋ), ***v.t.*** (١) هێنان؛ هاووردن.
(٢) بوون بە هۆی. ***( Fascism brought disaster.)*** .
(٣) پێدان. ***( Rest and exercise ~ a person health.)*** .
(٤) والێکردن؛ کارتێکردن؛ پێ کردن.
(٥) پارەکردن؛ فرۆشران بە ئەوەندە:
***( Used cars brought a good price last month.)***
(٦) خستنە بەردەمی دادگا؛ تاوان پێشاندان؛ دان بە دادگا:
***( to ~ someone to trial ; to ~ charges against)***
**bring about,** بوون بە هۆ؛ هێنانەدی
**bring around (or round),** (١) ڕا پێ گۆڕین؛ پێ سەلماندن.
(٢) دل کردنەوە. (٣) [Colloq.]: هۆش هێنانەوەبەر؛ هەناسە هێنانەوەبەر.
(٤) [Colloq.]: هێنان (بۆ سەردان):
***( to bring someone around to visit)***
**bring down,** (١) ڕووخاندن؛ هێنانەخوارەوە؛ داگرتن؛ خستن:
***( bring down a government)***
(٢) کوشتن؛ بریندارکردن.
(٣) هێنانەخوارەوە (نرخ)؛ کەمکردنەوە. ***( bring down prices)*** .
**bring forth,** (١) هێنانە بەرهەم؛ بەرگرتن؛ منداڵبوون.
(٢) ئاشکراکردن؛ دەرخستن؛ پێشاندان؛ خستنە بەرچاو.
**bring forward,** (١) پێشکەش کردن؛ پێشاندان (بەڵگە)؛
هێنانەپێشەوە (باس):
***( Can you bring forward any proof of what you say?)***
(٢) هێنانەپێشەوە یا گواستنەوە بۆ لاپەرەیەکی تازە (دەفتەرگری ژمێریاری).
**bring home to,** تێگەیاندن؛ پێشاندان؛ دەرخستن؛ خستنە مێشکەوە:
***( His death brought home to me the value of his friendship.; to bring a point home to a person)***
**bring in,** (١) لە دەرەوەی وڵاتەوە هێنان.
(٢) وەدەستهێنان؛ دەستخستن؛ لێ دەستکەوتن؛ پێدان (داهات).
(٣) پێشکەش کردن (بڕیاری سوێندخۆران بە دادگا)؛ ڕاپۆرت دان.
**bring off,** (١) هێنانەدی؛ هێنانە بەرهەم؛ بەجێهێنان.
(٢) ڕزگارکردن.
**bring on,** بوون بە هۆ (ڕوودان):
***( He brought the problem on himself. ; Her illness was- brought on by carelessness.)***
**bring out,** (١) خستنەڕوو؛ دەرخستن؛ ئاشکراکردن؛ هەڵماڵین:
***( The trial will bring out everything.)***
(٢) نواندن (شانۆگەری). (٣) بڵاوکردنەوە (پەرتووك، گۆڤار).
(٤) پێشاندان؛ هێنانەپێشەوە. (٥) پێناسینی کچێك بە کۆمەل.
**bring over,** (١) پێ سەلماندن؛ ڕا پێ گۆڕین. (٢) هێنان بۆ سەردان.
**bring to,** (١) هەناسە هێنانەوەبەر؛ هۆش هێنانەوەبەر.
(٢) وەستاندن (کەشتی).
**bring to an end,** دوایی پێ هێنان؛ کۆتایی پێ هێنان.
**bring to bear on,** خستنەسەر (زۆر)؛ ئاراستەکردن؛ بەکارهێنان لەگەڵدا (زۆر، هێز):
***( You must bring more pressure to bear on him.)***
**bring to light,** خستنەڕوو؛ دەرخستن؛ ئاشکراکردن؛ هەڵماڵین.
**bring up,** (١) پەروەردەکردن (منداڵ)؛ گەورەکردن؛ بەخێوکردن.
(٢) هێنانەکایەوە؛ پێشکەش کردن (بۆ باسکردن)؛ هێنانەپێشەوە (بۆ لێدوان)
(٣) ڕشانەوە؛ هێنانەوە؛ هەڵهێنانەوە. (٤) لەپڕ وەستان.
**bringing-up** (briŋ′iŋ-up′), ***n.*** (١) پەروەردەکردن؛ بەخێوکردن.
(٢) ڕەووشت فێرکردن.
**brink** (briŋk), ***n.*** قەراغ؛ لێوار؛ گوێ؛ کەنار؛ نزیك:
***( on the ~ of war ; on the ~ of the grave)***
**brinkmanship** (briŋk′mən-ship′), ***n.*** بەرەو کارەسات چوون؛ گرتنی ڕێبازی کارەسات ئەنجام.
**briny** (brīn′i), ***adj.*** سوێر؛ زۆر سوێر؛ تایبەتی بە سوێراو.
**brio** (brē′ō), ***n.*** زیتی؛ جۆش؛ جۆش‌وخرۆش؛ گورج‌وگۆلی.
**brioche** (brē′ōsh, brē′osh), ***n.*** جۆرە کولێرەیەکە بە هێلکە و کەرە و هەوێر دروست دەکرێت.
**briolette** (brē′ə-let′), ***n.*** ئەلماسێکی هەرمێ‌یی‌یە لاکانی سێگۆشەیە.
**briquette, briquet** (bri-ket′), ***n.*** کولۆ خەلووزی بەرد
**brisance** (brē′zäns′), ***n.*** هێزی ووردوخاش کردن یا شکاندن (ئەتۆم یا تەقەمەنی).
**brisk** (brisk), ***adj.*** (١) پەلە؛ گورج‌وگۆل؛ خێرا: ***( a ~ walk)*** .
(٢) تیژ و خۆش (با)؛ وریاکەرەوە: ***( The air was ~ and cold.)*** .
(٣) گەرم (بازاڕ): ***( Business was ~ yesterday.)*** .
**brisket** (bris′kit), ***n.*** (١) سنگی گیاندار. (٢) گۆشتی سنگ.
**brisling** (bris′liŋ), ***n.*** جۆرە ماسی‌یەکی بچکۆلەیە لە " ساردین " دەچێت.
**bristle** (bris′'l), ***n.*** (١) تووکی زبر یا تیژ (گیاندار، ڕووەك)؛ درك.
(٢) تووکی گیاندارێك کە دەکرێت بە فڵچە (وەك هی بەراز). (٣) تووکی فڵچە.
***v.i.*** (١) ڕەق بوون؛ ڕاستبوونەوە.
(٢) قژ گیف بوونەوە یا ڕاوەستان (لە توورەیی یا ترسدا).
(٣) خۆ گیف کردنەوە (بۆ ئامادەبوون بۆ شەڕ).
***v.t.*** (١) ڕەق کردن؛ ڕاستکردنەوە (وەك تووکی درکن). (٢) وەك درك تیژکردن.
**bristletail** (bris′'l-tāl′), ***n.*** کلك دڕکاوی: جانەوەرێکی بێ باڵە تووکی تیژ بە پاشەکەیەوەیەتی.
**bristly** (bris′li), ***adj.*** (١) تووکی تیژدار؛ دڕکاوی.
(٢) تیژ (وەك درك یا تووکی تیژ).
**brit, britt** (brit), ***n.pl.*** (١) بەچکەی هەندێك ماسی‌یە.
(٢) بوونەوەرێکی بچووکی دەریایە (ئەهەنگ و هەندێك ماسی لەسەری دەژین).
**Britain** (brit′'n, brit′ən), ***n.*** بەریتانیا.
**Britannia metal, britannia metal,** داڕشتەیەکە لە مس و تەنەکە و ئەنتیمۆن پێکدێت.

**Britannic** (bri-tan′ik), *adj.* بەریتانی

**Briticism** (brit′ə-siz′m), *n.* ووشە یا زاراوەیەکی تایبەتییە بە زمانی ئینگلیزی بەریتانیا: *(*“Petrol” *is a B~ for* “gasoline” *.)*.

**British** (brit′ish), *adj.* (١) تایبەتی بە بەریتانیاو هاوولاتییەکانی؛ بەریتانی؛ ئینگلیزی. (٢) تایبەتی بە کۆمونوێلسی بەریتانی.

*n.* زمانی ئینگلیزی؛ زمانی ئینگلیزی بەریتانیا.

**the British,** هاوولاتییانی بەریتانیا؛ خەلکی بەریتانیا؛ بەریتانییەکان

**British English,** زمانی ئینگلیزی بەریتانیا.

**Britisher** (brit′ish-ēr), *n.* ئینگلیز؛ ئینگلیزێك؛ هاوولاتییەکی بەریتانیا

**Briton** (brit′′n, brit′ən), *n.* (١) هاوولاتییەکی بەریتانیا؛ کەسێکی بەریتانی؛ کەسێکی بەریتانی یا کۆمونوێلسی بەریتانی (٢) دانیشتوویەکی بەریتانیای کۆن (لەپێش داگیرکردنی بەریتانیا لەلایەن ڕۆمانەکانەوە).

**britska, britzka, britzska** (brits′kə), *n.* جۆرە عەرەبانەیەکە سەرەکەی دەکرێتەوە.

**brittle** (brit′′l), *adj.* قرچۆك؛ ناسك.

*n.* شیرینییەکی قرچۆك یا ناسك.

**broach** (brōch), *n.* (١) شیشی گۆشت برژاندن؛ شیشی کەباب؛ شیش. (٢) شیشی کون پێ گەورەکردن. (٣) نەسکەنە (٤) کون؛ کونی بە نامێر کراو. (٥) یەخەبەند.

*v.t.* (١) کون کردن بۆ شلە لێ دەرهێنان: *(to ~ a keg)*. (٢) شلە لێ دەرهێنان (بەرمیل، دەفر) (٣) کون گەورەکردن (٤) (ا) هێنانەپێشەوە بۆ باسکردن؛ لێدووان: *(to ~ a subject)*. (ب) ئاشکراکردن؛ بلاوکردنەوە؛ درکاندن: *(to ~ a plan)*.

**broad** (brôd), *adj.* (١) پان (٢) فراوان. (٣) ڕوون؛ ڕووناك؛ دیار: *(~ daylight)*. (٤) ئاشکرا؛ دیار: *(a ~ purpose)* (٥) قورس (شێوەی قسەپێکردنی زمانێك لەلایەن بێگانەوە): *(a ~ accent)*. (٦) هەلماڵراو؛ ناشرین: *(a ~ joke)*. (٧) مێشك کراوە: *(a ~ mind; He takes a ~ view of the matter.)*. (٨) بێ سنوور؛ گشتگر: *(a ~ statement)*. (٩) گشتی؛ بنچینەیی: *(a ~ outline of the subject)*. (١٠) کراوە (بێژانی درێژی تیپ) (دەنگسازی) (وەك تیپی " a " لە ووشەی " father " دا).

*adv.* بە تەواوی؛ هەمووی.

*n.* (١) بەشە پانەکەی شتێك. (٢) [Slang]، کچ؛ ژن.

**broad arrow,** (١) تیری سەرپان (٢) نیشانەیەکە میری ئینگلتەرە دەیدات لە ماڵو موڵکی میریو جلوبەرگی بەندەکان

**broadax, broadaxe** (brôd′aks′), *n.* تەورێکی زل دەم پان.

**broad bean,** (١) پاقلە (٢) ڕووەکی پاقلە

**broadbill** (brôd′bil′), *n.* (١) باڵندەیەکی دەنووك کورتو پانە. (٢) جۆرە ماسییەکی دەریایە شەویلگەی سەرەوەی درێژە وەك دەنووك یا شمشێر پێشی دەووترێت " swordfish ").

**broadbrim** (brôd′brim′), *n.* (١) شەپقەی قەراغ پان. (٢) [B-] [Colloq.]، کۆمیکەر: ئەندامی کۆمەڵێکی ئاینی لاشەری ئەمەریکاییە ناوی " کۆمیکەرز " ە.

**broadcast** (brôd′kast′, brôd′käst′), *v.t.* (١) تۆوزان (دانەوێڵە)؛ پەرشوبلاوکردنەوە. (٢) دەنگوباس بلاوکردنەوە. (٣) بلاوکردنەوە (بە ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، سەتەلایت... هتد)

*v.i.* بلاوکردنەوە (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ بلاوکرانەوە

*adj.* (١) بلاو؛ بلاوبووەوە. (٢) تایبەتی بە ڕادیۆو تەلەفزیۆن.

*n.* (١) بلاوکردنەوە (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن). (٢) بەرنامەی بلاوکراوە (لەسەر ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن): *(a television ~ )*.

*adv.* بە هەموولایەکدا.

**broadcaster** (brôd′kas′tēr, brôd′käs′tēr), *n.* (١) بێژەر، بلاوکەرەوە (لەسەر ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن). (٢) ئامێر یا هۆی بلاوکردنەوە (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن).

**broadcloth** (brôd′klôth′, brôd′kloth′), *n.* (١) چۆخ؛ چۆغە. (٢) قوماشی ئاوریشم یا کەتان.

**broaden** (brôd′′n), *v.t.* فراوان کردن؛ پان کردن؛ گەورەکردن.

*v.i.* فراوان بوون؛ پان بوون؛ گەورەبوون.

**broad-gauge** (brôd′gāj′), *adj.* (١) پان؛ فراوان. (٢) [Colloq.]، مێشك کراوە؛ مێشك فراوان.

**broad guage,** (١) هێڵی ئاسنی پان. (٢) شەمەندەفەری پان.

**broad-gauged** (brôd′gājd′), *adj.* = **broad-gauge.**

**broad jump,** بازدی درێژ (بە گورەوە یا بەبێ گورەوە).

**broadleaf** (brôd′lēf′), *n.* تووتنی گەلاپان (بۆ سیگار دروستکردن).

**broadloom** (brôd′lōōm′), *adj.* پان (فەرش، بەڕە، ڕاخەر)

**broad-minded** (brôd′mīn′did), *adj.* مێشك کراوە؛ مێشك فراوان.

**broadside** (brôd′sīd′), *n.* (١) لاتەنیشتی سەرئاوی کەشتی. (٢) سەرجەمی ئەو تۆپو تفەنگەی دەتوانرێت بتەقێنرێت لە لاتەنیشتی کەشتییەکی جەنگەوە. (٣) تەقاندنی هەموو تۆپو تفەنگێکی دابەستراو بە لایەکی کەشتی جەنگدا. (٤) هێرشێکی توندو بەکار (لە ڕۆژنامەدا). (٥) ڕووی پانی شتێکی گەورە. (٦) پەڕەیەك کاغەزی گەورە (کە هەر لەسەر لایەکی شت نووسرابێت). (٧) [Colloq.]، جوێن؛ هێرشی توندوتیژی بەدەم.

*adv.* لە باری درێژی: *(The ship came ~ to the dock.)*.

**broadsword** (brôd′sôrd′, brôd′sōrd′), *n.* شمشێرێکی دەم پان.

**broadtail** (brôd′tāl′), *n.* (١) مەڕی دووگدار؛ مەڕی دووگ زل. (٢) پێستەی بەرخی ئەم مەڕە بە خورییەکەیەوە؛ فەروەی ئەم جۆرە خورییە

**Broadway** (brôd′wā′), *n.* (١) بروَدوەی: شەقامێکی گەورەی بەناوبانگە لە نیویۆرك بە شانۆو تیاترۆو یانەی شەو ناسراوە. (٢) ناوچەی شانۆو تیاترۆو یانەی شەو لە نیویۆرك.

**brocade** (brō-kād′), *n.* قوماشی نەقشونیگاراوی.

*v.t.* چنینی نەقشونیگار لەسەر قوماش.

**brocaded** (brō-kād′id), *adj.* نەقشونیگار لەسەر چنراو.

**brocatel, brocatelle** (brok′ə-tel′), *n.* قوماشی نەقشونیگار لەسەر چنراو (کە بۆ بەرگ تێگرتن بەکاردەهێنرێت).

**broccoli** (brok′ə-li), *n.* سەوزەیەکە لە توخمی قەرنابیت.

**broché** (brō-shā′), *adj.* نەقشونیگار لەسەر چنراو.

**brochette** (brō-shet′), *n.* شیشی بچووکی کەباب.

**brochure** (brō-shoor′, brō-shyoor′), *n.* نامیلکە.

**brock** (brok), *n.* گۆڕهەلکەنە.

**brocket** (brok′it), *n.* (١) ئاسکێکی نێرینەی دووساڵە. (٢) ئاسکێکی بچووکی شاخ کورتی ئەمەریکای باشوورە.

**brogue** (brōg), *n.* زمانی ئینگلیزی ئیرلەندە؛ زاراوەی ناوچەیی.

**brogue** (brōg), *n.* (١) پێلاوێکی ئیرلەندییە. (٢) پێلاوێکی ئینگلیزییە.

**brogue** (brōg), *n.* فێڵو تەڵەکە.

**broider** (broi′dēr), *v.t.* [Archaic], = **embroider.**

**broidery** (broi′dēr-i), *n.* [Archaic], = **embroidery.**

**broil** (broil), *v.t.* لێنان، برژاندن، یا پێشاندن لەناو فڕن یا تەنووردا.

*v.i.* (١) لێنران، برژان، یا پێشان لەناو فڕن یا تەنووردا. (٢) تووڕەبوون؛ شێتگیربوون.

*n.* (١) لێنان یا برژان لەناو فڕن یا تەنووردا؛ گەرماییەکی زۆر. (٢) خواردەمەنییەکی برژاو، لێنراو، یا پێشێنراو لەناو فڕندا.

**broil** (broil), *n.* دەمەقاڵێ؛ شەڕەقسە.

**broiler** (broil′ēr), *n.* (١) بەشی ژێرەوەی فڕن (کە خواردەمەنی تێدا دەبرژێنرێت یا دەبیشێنرێت) (٢) دەفری خواردەمەنی تێدا برژان لەناو فڕندا.
(٣) مریشکی برژاو لەناو فڕندا
**brokage** (brō′kij), *n.* دەلالی؛ مزی دەلالی.
**broke** (brōk), *past tense and archaic p.p. of* **break**.
*adj.* نابووت؛ مایەپووچ؛ بێ پارە: *( He is ~ . )* .
**go broke,** [Slang]. مایەپووچ بوون؛ نابووت بوون.
**go for broke,** [Slang]. سەروماڵ لەبێناودا دانان.
**broken** (brō′kən), *past participle of* **break**.
*adj.* (١) شکاو؛ پەککەوتوو؛ سەقەت.
(٢) ڕانەگیراو؛ شکاو: *( a ~ promise)* (٣) بێ هێز کراو؛ بێ هێز.
(٤) شکێنراو *( a ~ spirit)*
(٥) مایەپووچ؛ نابووت. (٦) پچڕپچڕ.
(٧) شەق وشڕ؛ شەق وپەق؛ ناتەواو؛ شکاو: *( He speaks ~ English.)* .
(٨) گیراو (حووانووە ئەسپ): *( a ~ horse)*
(٩) پلە هێنراوە خوارەوە؛ پلە کەم کراوە
**broken-down** (brō′kən-doun′), *adj.* (١) نەخۆش؛ پەرێشان.
(٢) پەککەوتوو؛ شکاو؛ لەکارکەوتوو (مەکینە)؛ بەکارنەماو.
**brokenhearted** (brō′kən-här′tid), *adj.* دڵ شکاو؛ حەفەتبار؛ غەمبار؛ جەرگ براو
**broker** (brō′kēr), *n.* (١) دەلال؛ حامباز
(٢) دەلالی بۆرسە یا پارەبازی
**brokerage** (brō′kēr-ij), *n.* (١) دەلالی؛ دەلالێتی
(٢) مزی دەلال؛ دەلالی
**bromal** (brō′mal), *n.* شلەیەکی بێ ڕەنگی بۆنداری چەورە (کیمیا).
**bromate** (brō′māt), *n.* برۆمات: خوێی ترشی برۆم.
*v.t.* (١) برۆمات تێکەڵاوکردن (٢) برۆمات لێدان
**bromic acid,** ترشی برۆم
**bromid** (brō′mid), *n.* = **bromide**.
**bromide** (brō′mid, brō′mid), *n.* (١) برۆم (کیمیا): برۆمید
(٢) ووتەیەکی پەڕپووت؛ کلێشە (٣) [Slang]: قسەی پەڕپووت کەر.
**bromidic** (brō-mid′ik), *adj.* پەڕپووت و بێ تام (ووتە)؛
**brominate** (brō′mi-nāt′), *v.t.* برۆم لێدان یا تێکەڵاوکردن (کیمیا).
**bromine** (brō′mēn, brō′min), *n.* برۆم (کیمیا)؛ برۆمین.
**bronchi** (broŋ′kī), *n. plural of* **bronchus**.
**bronchial** (broŋ′ki-əl), *adj.* تایبەتی بە بۆری هەوا.
**bronchial tubes,** بۆری هەوا (پزیشکەوانی).
**bronchitis** (broŋ-kī′tis), *n.* هەوکردن یا داگیرسانی بۆری هەوا؛ نەخۆشی بۆری هەوا
**broncho** (broŋ′kō), *n.* = **bronco**.
**broncho-** (broŋ′kō, broŋ′kə), پێشگرێکە بەمانای بۆری هەوا
**bronchopneumonia** (broŋ′kō-nōō-mō′nyə, broŋ′kō-nū-mō′ni-ə), *n.* هەوکردن یا داگیرسانی بۆری هەواو پەڕەی سیپەکان.
**bronchoscope** (broŋ′kə-skōp′), *n.* ئامێری پشکنین و دەرمان کردنی بۆری هەوا
**bronco** (broŋ′kō), *n.* ئەسپێکی کورتەباڵای کێوی یا نیمچەکێوییە لە ڕۆژئاوای ئەمەریکا.
**broncobuster** (broŋ′kō-bus′tēr), *n.* کاوبۆیەکە کە ئەسپی "برۆنکۆ" دەگرێت یا دەهێنێتە بەربار.
**brontosaurus** (bron′tə-sôr′əs), *n.* برۆنتۆسۆر: داینەسۆرێکی زلی ئەمەریکی قڕتێکەوتووە
**bronze** (bronz), *n.* (١) برۆنز: داڕشتەیەکی مس و تەنەکەیە.
(٢) پەیکەرێکی برۆنزی؛ شتێکی برۆنزی. (٣) ڕەنگی قاوەیی سوورباو.
*adj.* برۆنزی؛ لە برۆنز دروستکراو.
*v.t.* وەك برۆنز لێکردن؛ ڕەنگی وەك ڕەنگی برۆنز لێکردن.
*v.i.* ڕەش داگیرسان (مرۆڤ لەبەر هەتاودا).
**Bronze Age,** چەرخی برۆنزی: ئەو چەرخەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە ئامێری لە برۆنز تێدا دروست دەکرا.
**bronzy** (bron′zi), *adj.* برۆنزی؛ وەك ڕەنگی برۆنز؛ قاوەیی سوورباو.
**brooch** (brōch, brōōch), *n. Also* **broach,** یەخەبەند (ژنانە).
**brood** (brōōd), *n.* (١) جووچك؛ جووجەڵە؛ بەچکەی باڵندە.
(٢) کۆمەڵێك جووجەڵەی پێکەوە هەڵهاتوو یا بەخێوکراو.
(٣) ووردیلەکانی خێزانێك؛ منداڵی ماڵێك.
(٤) توخم؛ چەشن؛ جۆر: *( a ~ of ideas)* .
*v.t.* (١) هەڵهێنان (هێلکە)؛ لەسەر کڕکەوتن و هەڵهێنان.
(٢) باڵ بەسەرداگرتن یا کێشان و پاراستن.
*v.i.* (١) هەڵهێنان (هێلکە)؛ لەسەر کڕکەوتن؛ کڕکەوتن.
(٢) بە قووڵی بیرلێکردنەوەو مەراق خواردن؛ پیش خواردنەوە:
*( He is still ~ing over his misfortunes. ; He ~s all the time.)*
**brood on (or over),** (١) باڵ بەسەردا گرتن یا کێشان؛ خول خواردن یا خولانەوە بەسەردا. (٢) زۆر بیرکردنەوەو مەراق خواردن؛ پیش خواردنەوە
**brooder** (brōōd′ēr), *n.* (١) کڕ (مریشك، باڵندە).
(٢) مەکینەی هێلکە هەڵهێنان؛ شوێنێکی گەرم بۆ جووجەڵە پەروەردەکردن
(٣) کەسێکی زۆر بیرکەرەوەو مەراق خۆر؛ کەسێکی کڕکەوتوو.
**broody** (brōōd′i), *adj.* (١) کڕ (مریشك، باڵندە).
(٢) زۆر بیرکەرەوەو مەراق خۆر.
**brook** (brook), *n.* جۆگەلە؛ جۆگە.
**brook** (brook), *v.t.* دەربردن؛ دان بەخۆداگرتن:
*( I cannot ~ his insolence.)*
**brooklet** (brook′lit), *n.* جۆگەلە.
**broom** (brōōm, broom), *n.* (١) گسك.
(٢) دەوەنێکی گەڵا ووردی لق بارێکی گوڵ ڕەنگینە.
*v.t.* گسك لێدان؛ ماڵین.
**broomstick** (brōōm′stik′, broom′stik′), *n.* دەسکی گسك؛ کلکی گسك.
**broth** (brôth, broth), *n.* گۆشتاو؛ فڕوجاو؛ شۆربای ڕوون.
**brothel** (brôth′əl, broth′əl, bro*th*′əl), *n.* قەحبەخانە.
**brother** (bru*th*′ēr), *n.* (١) برا. (٢) زڕبرا. (٣) برادەرێکی زۆر نزیك.
(٤) کەسێکی هاوڕەگەز، هاوپیشە، هاوبیر، هاوخوێن؛ هاوڕێ.
(٥) قەڵەندەر؛ سۆفی؛ ئەندامی کۆمەڵێکی ئاینی.
**brotherhood** (bru*th*′ēr-hood′), *n.* (١) برایەتی.
(٢) برادەرێتی؛ هاوڕێیەتی.
(٣) ڕێکخراوێکی هاوپیشە، هاوبیروباوەڕ، هاوڕەگەز... هتد.
(٤) هەموو ئەندامانی پیشەیەك؛ ئەندامانی جڤاتێك.
**brother-in-law** (bru*th*′ēr-in-lô′), *n.* ژن برا؛ زاوا؛ ئاوەڵ زاوا؛ شووبرا.
**brotherliness** (bru*th*′ēr-li-nis), *n.* برایەتی؛ هەستی برایانە؛ هەستی برایەتی.
**brotherly** (bru*th*′ēr-li), *adj. & adv.* برایانە؛ وەك برا.
**brougham** (brōōm, brōō′əm), *n.* (١) عەرەبانەی سەرگیراو.
(٢) جۆرە ئوتومبیلێکە.
**brought** (brôt), *past tense and p.p. of* **bring.**
**brow** (brou), *n.* (١) برۆ. (٢) ناوچەوان.
(٣) ڕووخسار؛ سەروچاو؛ ڕوو: *( an angry ~ )* .
(٤) قەراغی لێژاییەك؛ لاسەرووی گردێك.
**knit one's brows,** ڕووی خۆ گرژکردن؛ دەموچاوی خۆ مۆن کردن.
**browbeat** (brou′bēt′), *v.t.* بەچەترسێن کردن (بە ڵێ مۆڕبوونەوە یا بەسەردا قیژاندن): *( to ~ a person into doing something)*
**brown** (broun), *adj.* (١) قاوەیی؛ بۆر.
(٢) گەنم ڕەنگ؛ ڕەشکەڵە؛ ڕەشتاڵە.

***v.t. & v.i.*** (١) قاوەیی کردن؛ ڕەش داگیرسان. (٢) زەردکردن (گۆشت).

**brownie** (broun′i), ***n.*** (١) جنۆکەیەکی بچووکە (کە بەگوێرەی ئەفسانە ئیش‌وکاری ناومال دەکات بۆ خەلك بە شەو).

(٢) [B-]، کچێکە لە تیپی دیدەوانیدا لەنێوان تەمەنی هەشت تا یانزە ساڵیدا.

(٣) قاشە کێکێکی چوکلێتە فستق و گوێزو بادەمی تێدایە.

**brownish** (broun′ish), ***adj.*** لە قاوەیی دەچێت؛ مەیلەو قاوەیی.

**brownnose** (broun′nōz′), ***n.*** مەراییکەر؛ پشی پشی کەر.

***v.i. & v.t.*** مەرایی کردن؛ پشی پشی کردن.

**brownout** (broun′out′), ***n.*** چرای شار کوژاندنەوە (لە ترسی دوژمن یا بۆ ووزە کەم کارکردن یا برانی کارەبا)؛ نیمچە تاریك کردنی شار.

**brown rice,** برنجی نەکوتراو؛ برنجی توێکاوی.

**brown shirt, Brown Shirt,** (١) کراس بۆر. ئەندامێکی هێزی میلیشیای نازی ئەڵمانیا. (٢) نازی؛ کەسێکی نازی؛ هیتلەرپەرست.

**brownstone** (broun′stōn′), ***n.*** بەردە قاوەیی. بەردێکی لمینە خانووی پێ درووست دەکرێت.

**brown sugar,** شەکری بۆر.

**browse** (brouz), ***n.*** گەڵاو تەرزو لق‌وپۆپی درەخت و رووەك کە گیاندار دەیخوات.

***v.t.*** (١) مرو مووش کردن؛ خواردن. (٢) لەوەڕین؛ لێ لەوەڕین.

***v.i.*** (١) خواردن (گەڵاو لق‌وپۆپ و تەرێ).

(٢) چاوپێداخشاندن (پەرتووك و گۆڤارو ڕۆژنامە لە کتێبخانەدا).

(٣) سەیرکردن بە شێنەیی (شتوومەکی ناو بازاڕ یا شوێنی تر).

**bruin** (broo͞′in), ***n.*** وورچ

**bruise** (broo͞z), ***v.t.*** (١) ڕووشاندن؛ شین کردنەوە (پێست)؛ بریندارکردن. (٢) هارین (بە دەسك و هەوان).

(٣) هەست ئازاردان؛ هەست بریندارکردن.

***v.i.*** . ***( He ~s easily.)*** ڕووشان؛ شین بوونەوە (پێست)؛ هەست بریندار‌بوون:

***n.*** (١) ڕووشاوی؛ ڕووشان؛ شین بوونەوە. (٢) ڕووشاوی پێستی میوە.

**bruiser** (broo͞z′ẽr), ***n.*** (١) بۆکسبازێکی بەهێز.

(٢) شەلاتی؛ کەسێکی شەڕانی

**bruit** (broo͞t), ***n.*** [Archaic], قاو؛ دەبدەبە.

***v.t.*** قاوخستنەوە؛ تەپڵ بۆ هەڵگرتن.

**brumal** (broo͞′m'l), ***adj.*** زستانی؛ زستانە.

**brume** (broo͞m), ***n.*** تەم؛ تەمومژ؛ هەڵم.

**brummagem** (brum′ə-jəm), ***adj.*** [Colloq.], درۆزنە؛ بازاڕی؛ بریقەدارو هەرزانبەها.

***n.*** [Colloq.], شتی بریقەدارو بێ نرخ (بەتایبەتی خشڵ).

**brunch** (brunch), ***n.*** ژەمی بەرچایی و قاوەڵتی پێکەوە (کە نەختێك پێش نیوەڕۆ دەخورێت)؛ نانی بەیانی و نیوەڕۆ پێکەوە.

**brunet** (broo͞-net′), ***adj.*** گەنم ڕەنگ؛ قژڕەش و چاوڕەش؛ سەوزەڵە.

***n.*** پیاوێك یا کوڕێکی سەوزەڵە؛ نێرینەیەکی قژڕەشی چاوڕەش.

**brunette** (broo͞-net′), ***adj.*** = **brunet.**

***n.*** ئافرەتێکی قژڕەشی چاوڕەشی گەنم ڕەنگ؛ ئافرەتێکی سەوزەڵە.

**brush** (brush), ***n.*** (١) فڵچە (قژداهێنان، جل، بۆیە، ددان)؛ ڕنەك.

(٢) فڵچەکاری؛ پاککردنەوە یا بۆیەکردن.

(٣) کلکی تووکن (وەك هی ڕێوی). (٤) لێخشان؛ بەئاستەم بەرکەوتن.

(٥) فڵچەکاری؛ شێوازی فڵچە بەکارهێنانی هونەرمەندێك.

(٦) تەل، شیش، یا پەڕەیەکی گەیەنەری کارەبایی.

***v.t.*** (١) قژداهێنان؛ فڵچەلێدان؛ بۆیەکردن؛ پاککردنەوە بە فڵچە؛ ڕنەك کردن.

(٢) لێخشاندن؛ بەئاستەم لێدان یا بەرکەوتن؛ لێکەوتن.

(٣) لابردن بە فڵچە یا وەك بە فڵچە.

***v.i.*** (١) بەلادا تێپەڕبوون و بەرکەوتن؛ لێخشان؛ بەئاستەم بەرکەوتن؛ بەئاستەم پاڵ پێوەنان یا لابردن. (٢) فڵچە بەکارهێنان.

**brush aside (or away),** (١) لابردن؛ خستنە ئەولاوە؛ پاڵ پێوەنان.

(٢) گوێ پێ نەدان؛ بایەخ پێ نەدان:

***( He brushed aside all criticism of his conduct.)***

**brush off,** لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ دەرکردن؛ پاڵ پێوەنان (مەجاز)؛ خۆ لێ ڕزگارکردن: ***( She brushed him off.)*** .

**brush up,** (١) پاککردنەوە؛ جوان کردن؛ ڕێکخستن.

(٢) بەمەزەردکردن (مەجاز)؛ خوێندنەوەو هێنانەوەبیر خۆ؛ فێربوونەوە:

***( I want to brush up on my English.)***

**brush** (brush), ***n.*** (١) (ا) دارو دەوەن و بنچك و پووش.

(ب) شوێنێکی دارو دەوەن و بنچکاوی؛ بێشە.

(٢) دەشتی دارو دەوەناوی کەم ئاوەدانی.

(٣) لق و پۆپی براوو شکاو.

**brush** (brush), ***v.i.*** بە پەلە ڕۆیشتن؛ پەلەکردن؛ خێراکردن.

***n.*** بەرەنگاربوون؛ تووش بوون؛ بەیەکداهاتن:

***( He had a ~ with death.)***

**brush-off** (brush′ôf′), ***n.*** [Slang], دەرکردن؛ پاڵ پێوەنان.

**give (a person) the brush-off,** لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ پاڵ پێوەنان؛ دەرکردن؛ خۆ لێ ڕزگارکردن بە پەلە.

**brushwood** (brush′wood′), ***n.*** (١) لق‌وپۆپی براو یا کەوتوو.

(٢) بنچك و دەوەن و گژوگیا؛ بێشەلان.

**brushwork** (brush′wûrk′), ***n.*** (١) فڵچەکاری؛ نیگارکێشی.

(٢) شێوازی نیگارکێشی تایبەتی هونەرمەندێك: ***( Renoir's ~ )*** .

**brushy** (brush′i), ***adj.*** زبر؛ تووکن؛ پڕ تیسکی زبر.

**brushy** (brush′i), ***adj.*** بنچکاوی؛ بە بنچك و دەوەن و گژوگیا داپۆشراو.

**brusque** (brusk, broosk), ***adj.*** لەڕوو (قسە)؛ ووشك و ڕەق و ناشرین (جۆری قسەکردن و ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکدا)؛ قسەڕەق.

**Brussels sprouts,** سەوزەیەکە ئەوەندەی گوێزێکە لە توخمی کەلەرمە.

**brutal** (broo͞′t'l), ***adj.*** درندە؛ درندانە؛ بێ بەزەیی؛ دڵڕەق.

**brutality** (broo͞-tal′ə-ti), ***n.*** (١) درندەیی؛ بێ بەزەیێتی؛ دڵڕەقی.

(٢) کردەوەیەکی درندانە.

**brutalize** (broo͞′t'l-īz′), ***v.t.*** (١) وەك درندە لێکردن؛ کردن بە درندە.

(٢) بە درندانە لەگەڵ جووڵانەوە؛ ئازاردان.

**-brutalization** ***(n.).***

**brute** (broo͞t), ***adj.*** (١) بێ مێشك: ***( a ~ beast)*** .

(٢) بێ هەست: ***( the ~ force of nature)*** .

(٣) چوارپێ؛ گیانداری (٤) درندە؛ بێ بەزەیی؛ دڵڕەق؛ کەر.

***n.*** (١) چوارپێ (کێوی یا ماڵی)؛ گیاندار.

(٢) کەسێکی چوارپێ؛ کەسێکی کەرو بێ مێشك.

**brutify** (broo͞′tə-fī′), ***v.t. & v.i.*** = **brutalize.**

**brutish** (broo͞t′ish), ***adj.*** (١) درندە؛ بێ بەزەیی؛ دڵڕەق.

(٢) کەرو بێ مێشك؛ چوارپێ؛ کەرتر: ***( He is ~ .)*** .

**bryology** (brī-ol′ə-ji), ***n.*** زانستی قەوزە (زیندەوەرزانی)؛ قەوزەناسی.

**bryony** (brī′ə-ni), ***n.*** چەند جۆرە ڕووەکێکە لە توخمی کوولەکە.

**bryophyte** (brī′ə-fīt′), ***n.*** قەوزە.

**bryozoan** (brī′ə-zō′ən), ***adj.*** قەوزەیی (گیانداری ئاوی زۆر بچووك).

***n.*** گیانداری ئاوی زۆر بچووکی قەوزەیی.

**B.S.,** = **Bachelor of Science.,** بەکالۆریۆسی زانست.

**B.Sc.,** = **Bachelor of Science.**

**bub** (bub), ***n.*** [Colloq.], برا (لەڕووی خۆشەویستی‌یەوە بۆ بانگ کردن).

**bubal, bubale** (bū′b'l), ***n.*** = **bubalis.**

**bubalis** (bū′bə-lis), ***n.*** کەڵەکێوی‌یەکی ئەفەریقایی‌یە.

**bubble** (bub′'l), ***n.*** (١) بڵق؛ سابوون یا بڵقی ئاو: ***(soap ~s)*** .

(٢) پیلان یا بیروڕایەکی خەیاڵی، فشەڵ، یا هیچ‌وپووچ.

(٣) بڵقەبڵق؛ قڵپەقڵپ.

***v.i.*** (١) بڵقەبڵق کردن؛ بڵقەبڵق هاتن. (٢) قوڵپ دان؛ کوڵان.

*v.t.* (١) هێنانە ئوڵپ، قوڵپ پێدان. (٢) هێنانە بڵقەبڵق (٣) [Archaic]. دەستبرین؛ خەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن.

**bubble over,** (١) هەڵچوون (شلەی کوڵاو).
(٢) خۆ بۆ ڕ نەگیران لە خۆشیدا؛ هاتنە جۆش.

**bubble bath,** (١) گەرماوی ناو بانیۆ بە سابوونی بۆنخۆش و کەفاوییەوە. (٢) سابوونی بۆنخۆش و کەفاوی وەها.

**bubble gum,** بنێشتی بڵقدار (لەکاتی جووینددا دەتوانرێت بڵقی پێ دروست بکرێت.

**bubbler** (bub'lēr), ***n.*** پلووسک که ئاوی کانیاوی لێوە دەخورێتەوە بە دەست یا بە دەم.

**bubbly** (bub'li), *adj.* (١) بڵقاوی، بڵقەبڵقکەر: *(a ~ liquid)*.
(٢) کەیف قنج و بەجۆش وخرۆش: *(a ~ group of people)*.

**bubo** (bū'bō), ***n.*** ئاوسانی لووی لەمفاوی بن باڵ و بن ڕان؛ خەیارە.
-bubonic *(adj.)*.

**bubonic plague,** تاعوونە ڕەشە

**bubonocele** (bū-bon'ə-sēl'), ***n.*** نیمچە قوزی

**buccal** (buk''l), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕوومەت؛ گۆنەیی.
(٢) تایبەتی بە ناودەم؛ دەمی

**buccaneer** (buk'ə-nēr'), ***n.*** چەتەی دەریا.

**buccinator** (buk'si-nā'tēr), ***n.*** ماسولکەیەکی تەنکە لەنێوان ڕوومەت و سووچی دەمدا.

**bucentaur** (bū-sen'tôr), ***n.*** (١) گیاندارێکی ئەفسانەیییە نیوەی مرۆڤە و نیوەکەی تری گایە. (٢) کەشتییەکی میری " ڤینیسیا " ی کۆنە.

**buck** (buk), ***n.*** (١) نێرەی ئاسک و بزنەکێوی و کەروێشک.
(٢) هەڵتووڕاندن؛ هەڵتیران. (٣) شۆقدان؛ قوچدان؛ قۆچ هاویشتن.
(٤) پیاوێکی تەڕپۆش.
(٥) [Colloq.] هەرزەکارێکی قولەڕەش (لەڕووی سووکییەوە).

***v.i.*** (١) هەڵتیران (بەتایبەتی ئەسپ یا هێستر کە بیەوێت سوارەکە بگلێنێت).
(٢) شۆقدان ؛ قوچدان؛ قۆچ هاویشتن.
(٣) [Colloq.] بەرهەڵستی کردن بەتوندی؛ سڵ کردنەوە؛ مان گرتن.
(٤) [Colloq.] هەڵبەزودابەزکردن (ئوتومبیل)؛ بە تەکان ڕۆیشتن.

***v.t.*** (١) قۆچ لێدان؛ شۆق لێدان
(٢) هێرش بردنەسەر بە تۆپەوە (یاری فوتبۆلی ئەمەریکی).
(٣) سوار حستنەخوارەوە (ئەسپ، هێستر).
(٤) [Colloq.] بەرهەڵستی کردن بەتوندی؛ دژوەستان.

**buck for,** [Military Slang], هەوڵ بۆ دان (پلە بەرزبوونەوە)

**buck up,** [Colloq.], دڵی خۆ خۆش کردن؛ غیرەت دانەبەر خۆ؛ خۆ گورج وگۆڵ کردنەوە؛ وورە نانەبەر خۆ؛ شان دانەبەر (ناخۆشی).

**buck** (buk), *adj.* [Military Slang], نزمترین پلەی پۆلێك یا چینێك (سوپا): *(a ~ private)*.

**buck** (buk), ***n.*** (١) ئەسپەدارینە (دارتاشی)
(٢) ئەسپەدارینەی بە چەرم داپۆشراو (تەنافبازی).

**buck** (buk), ***n.*** [Slang]. دۆلار

**a fast buck,** پارەی بەدەستهانی و خێرا دەستکەوتوو؛ پارەی بەلاش:
*(to try to make a fast buck)*

**buck** (buk), ***n.*** نیشانەیەکە لەبەردەمی ئەو یاریکەرەدا دادەنرێت کە جاری دوایی ئۆبەیەتی کاغەز بدات

**pass the buck,** [Colloq.], لۆمە یا بەرپرسیاری لەسەر خۆ لابردن و سەپاندنی بەسەر یەکێکی تردا

**buckaroo** (buk'ə-roo', buk'ə-roo'), ***n.*** = cowboy.

**buck bean,** ڕووەکێکی زۆنگاوی گوڵ سپی و پەمەیی و گەڵا سێ فلیقانەیە

**bucker** (buk'ēr), ***n.*** وولاخی حووتەهاوێژ و هەڵتیزێن (ئەسپ، هێستر).

**bucket** (buk'it), ***n.*** (١) سەتڵ. (٢) دۆلکە. (٣) پڕ سەتڵێك

***v.t.*** (١) ئاوهەڵهێنجان بە سەتڵ؛ ئاوکێشان یا شلە گواستنەوە بە سەتڵ و دۆلکە؛ کردنە سەتڵ یا دۆلکەوە. (٢) [Colloq.]، خێرا ئەسپ لێخوڕین؛ ئەسپ ڕەتاندن.

*v.i.* (١) بە پەلەو هەڵبەزودابەز ڕۆیشتن؛ تەکان دان.
(٢) پەلەکردن؛ خێراکردن.

**kick the bucket,** [Slang], مردن.

**bucketful** (buk'it-fool'), *adj.* پڕ سەتڵێك.

**bucket seat,** کورسییەکی یەك کەسی پشت خڕە بەپێشدا دەنووشتێنرێتەوە (لە ئوتومبیل و فڕۆکەدا بەکاردەهێنرێت).

**bucket shop,** دووکان یا کۆمپانیای پارەبازی؛ دەزگای پارەبازی.

**buckeye** (buk'ī'), ***n.*** (١) شابەڕووی ئەسپ: درەختێکی گوڵ ڕەنگینی گەڵا گەورەیە تۆوەکەی لە کیسەی دڕکاویدایە. (٢) تۆوی ئەم درەختە.
(٣) [B-]، [Colloq.]، دانیشتوویەکی ویلایەتی " ئۆهایۆ " ی ئەمەریکییە.

**buck fever,** [Colloq.], جۆش وخرۆشی ڕاوچی تازە (کە بۆ یەکەم جار نێچیر بەدی دەکەن).

**buckhound** (buk'hound'), ***n.*** تانجی؛ سەگی ڕاوە ئاسك

**buckish** (buk'ish), *adj.* تەڕپۆش؛ تایبەتی بە تەڕپۆشی.

**buckle** (buk''l), ***n.*** ئاوزوونە (پشتێنی قایش، زین، پۆستاڵ).

*v.t.* (١) ئاوزوونەلێدان؛ بە ئاوزوونە لێکدان. (٢) پێکەوەبەستن؛ لێکدان

*v.i.* (١) ئاوزوونە لێدران؛ بە ئاوزوونە پێکەوەبەستران.
(٢) ڕۆران گرتن؛ چنگ دانە یەك.

**buckle down,** بە دڵ کۆشش کردن؛ شان دانەبەر کار؛ چاك بەلادا کردن.

**buckle up,** خۆ بەستنەوە (بە پشتێنی ناو ئوتومبیل یا فڕۆکە).

**buckle** (buk''l), *v.i.* نووشتانەوە (لەژێر زەبر یا قورساییدا)؛ چەمانەوە؛ چەمینەوە؛ پسان؛ هەرەس بردن: *(The steel beams ~d.)*.

*v.t.* نووشتاندنەوە؛ چەماندنەوە؛ پساندن.

**buckle under,** [Colloq.], هەرەس بردن (مرۆڤ)؛ ڕووخان؛ خۆ بەدەستەوەدان؛ شکان (لەبەردەمی زەبروزەنگدا)؛ ملدان؛ کۆڵدان:
*(He didn't buckle under pressure.)*

**buckler** (buk'lēr), ***n.*** (١) زرێیەکی بچووکە بە دەستەوە دەگیرێت یا دەکرێتە قۆڵەوە. (٢) پارێزەر؛ هۆی پاراستن.

*v.t.* پاراستن.

**bucko** (buk'ō), ***n.*** سێبەندی؛ شەلاتی.

**buckra** (buk'rə), ***n.*** مرۆڤی سپی (بە زمانی قولەڕەشی ئەفەریقا).

**buckram** (buk'rəm), ***n.*** (١) قوماشێکی جیرکراوە بە جەوی (بەرگی پەڕتووکی لێ دروست دەکرێت). (٢) ووشکی و ڕەقی ڕەووشت.

*adj.* (١) تایبەتی بەم جۆرە قوماشە. (٢) ووشك و ڕەق (ڕەووشت).

*v.t.* جیرکردن؛ ڕەق کردن.

**bucksaw** (buk'sô'), ***n.*** مشاری گەورە.

**buckshot** (buk'shot'), ***n.*** ساچمەی گەورە (بۆ ڕاوە ئاسك و گیانداری گەورەی تر).

**buckskin** (buk'skin'), ***n.*** (١) پێستەی ئاسك.
(٢) چەرمێکی نەرمی قایمی بۆرە لە پێستەی ئاسك دروست دەکرێت
(٣) ئەسپی بۆر. (٤) *(pl.)*، پانتۆڵ و پێڵاوی چەرمی ئاسك.
(٥) [B-]، سەربازی شۆڕشی ئەمەریکا.

*adj.* تایبەتی بە چەرمی ئاسك.

**bucktooth** (buk'tooth'), ***n.*** ددانی سەردەرپەڕیو.

**buckwheat** (buk'hwēt'), ***n.*** (١) گەنمی ڕەش: ڕووەکێکی گوڵ سپی بۆنخۆشە تۆوێکی سێ سووچ دەگرێت. (٢) تۆوی ئەم ڕووەکە کە دەدرێت بە ئەسپ و مریشك یا خواردەمەنی لێ دروست دەکرێت.
(٣) ئاردی ئەم دانەوێڵەیە.

**bucolic** (bū-kol'ik), *adj.* (١) تایبەتی بە شوان و دەشت ودەر؛ شوانی.
(٢) لادێ؛ تایبەتی بە لادێ؛ تایبەتی بە ژیانی لادێ.

*n.* (١) هەڵبەستێکە دەربارەی شوان و لادێ و ژیانی لادێ.
(٢) لادێیی؛ شوان؛ کشتیار؛ وەرزێر.

**bud** (bud), ***n.*** (١) چرۆ؛ خونچە؛ گۆپکە.

(٢) کەسێك یا شتێکی پێنەگەیشتوو یا فەریك.

*v.i.* (١) خونچەکردن؛ چرۆکردن؛ گوێکەکردن؛ پشکوتن؛ گەشانەوە.
(٢) پێگەیشتن؛ گەورەبوون؛ هەراش بوون. (٣) لە باری فەریکیدا بوون.

*v.t.* (١) چرۆ پێ دەرکردن؛ خونچەپێکردن. (٢) موتوربەکردن.

**in bud,** خونچەدار؛ چرۆدەرکردوو؛ گەشاوە؛ گوڵ بەدەم.

**in the bud,** بە منداڵی یا کوڕپەیی؛ بە خونچەیی؛ بە تازەیی؛ بە ساوایی.

**nip in the bud,** لەناوبردن. نەهێشتن. یا وەستاندن بە ساوایی پێش تەشەنەکردن و لەدەست دەرچوون:

[ *They nipped the rebellion in the bud. ; to nip a plan (plot, disease, idea) in the bud* ]

**Buddha** (bood′ə), ***n.*** (١) بوودا: دانەری ئاینی " بوودی " (دەڵێن: لە ساڵی ٥٦٣ – ٤٨٣ ی پ.ز. لە هیندستان ژیاوە).
(٢) کەسێك کە گەیشتووەتە پلەیەك کە لە هەمووشتێك تێگەیشتووە بەگوێرەی رێبازو ئاینی " بوودا ". (٣) وێنەی " بوودا "

**Buddhism** (bood′iz′m), ***n.*** ئاینی بوودا؛ بوودیتی: کە دەڵێت: ئێش و ئازار بەشێکە لە ژیان و لەرێگەی دابینکردنی ئارەزوو و بیرکردنەوەو ژیانی پاك و راستەوە ئێش و ئازار دوایی پێ دەهێنرێت.

**Buddhist** (bood′ist), ***n.*** کەسێکی بوودی؛ بوودییەك.

***adj.*** بوودی؛ تایبەتی بە ئاینی " بوودا "

**budding** (bud′iŋ), ***adj.*** تازەکوورە؛ ساوا: *( a ~ writer)* .

**buddle** (bud′'l, bood′'l), ***n.*** تەشت یا ناوەرۆی لێژی کانزای خاو پاکردنەوە.

**buddy** (bud′i), ***n.*** [Colloq.]. (١) هاوڕێ؛ برادەر؛ هەڤاڵ.
(٢) ئاوەڵ سەرباز

**budge** (buj), ***v.t.*** بزوواندن؛ جووڵاندن

***v.i.*** (١) جووڵان؛ بزووان: *( I won't ~ one inch.)* .
(٢) هەڵوێست گۆڕین؛ را گۆڕین.

**budge** (buj), ***n.*** فەروە (بەتایبەتی لە پێستەی بەرخ دروستکراو).

***adj.*** (١) فەروە لەبەر (٢) بە کەش‌وفش؛ ترزل.

**budget** (buj′it), ***n.*** (١) کیسە؛ جزدان؛ شتی ناو کیسە یا جزدان.
(٢) برێك شت. (٣) بووجە.

***v.t.*** (١) (ا) بووجە ئامادەکردن؛ بووجەکردن.
(ب) خستنەناو بووجەوە؛ بووجە بۆ دانان.
(٢) نەخشە بۆ دانان؛ رێکخستن (بۆ باش بەکارهێنان و بەفیڕۆنەدان):

*( B~ your time.)*

**budgetary** (buj′i-ter′i), ***adj.*** بووجەیی؛ تایبەتی بە بووجە:

*( ~ matters)*

**budget plan,** بە مانگانە؛ بە قیست؛ بە بەش بەش.

**buff** (buf), ***n.*** (١) چەرمی گامێش.
(٢) چاکەتێکی سەربازی کە لە چەرمی گامێش دروستکرابێت.
(٣) دارێك یا پێچکەیەکی چەرم تێگیراو (بۆ شت پاکردنەوەو بریقەپێدان بەکاردەهێنرێت). (٤) رەنگێکی زەردی بێ رەنگ یا مردوو.
(٥) [Colloq.]: پێستی رووت.
(٦) [Colloq.]، مۆگر؛ حەزکەر: *( a movie ~ ; a jazz ~ )* .

***adj.*** (١) لە چەرمی گامێش دروستکراو. (٢) زەردێکی بێ رەنگ یا مردوو.

***v.t.*** (١) ساف‌ولووس کردن و بریقاندنەوە بە چەرمی گامێش.
(٢) رەنگی زەردی کاڵ لێدان.

**buff** (buf), ***n.*** پیاکێشان؛ لێدان؛ پیاماڵین؛ تەپە.

***v.t.*** کەمکردنەوەی زەبر.

**buffalo** (buf′'l-ō′), ***n.*** (١) (ا) گامێش (ب) گامێشی ئەمەریکی.
(٢) رۆبێکە لە پێستەی گامێشی ئەمەریکی دروست دەکرێت.
(٣) جۆرە ماسییەکی پشت قەمووره (ئێسقانی ووردی زۆرە).

***v.t.*** [Slang], بەچەترسێن کردن؛ ترساندن؛ سام ئانەبەر:

*( She's got him ~ed.)*

**buffalo bird,** باڵندەی گامێش: چەند جۆرە باڵندەیەکن بە گامێش و رەشەووڵاخەوە دەنیشنەوەو زێرو گەنەیان لێ دەدۆزنەوە.

**buffalo bug,** قالۆنچەی گامێش: بچووك و رەش و بەڵەکاوییە.

**buffalo fish,** جۆرە ماسییەکی پشت قەمووره (ئێسقانی ووردی زۆرە).

**buffalo grass,** گیای گامێش: گیایەکی کورتی گەڵا باریکی دەشتە لەوەڕگاکانی ئەمەریکایە.

**buffalo robe,** رۆبێکە لە پێستەی گامێشی ئەمەریکی دروست دەکرێت.

**buffer** (buf′ēr), ***n.*** (١) ئامێری زەبر کەمکەرەوە (مەکینەکاری).
(٢) بەربەست؛ کەسێك یا شتێك کە دەکەوێتە نێوان دوو کەس یا شت یا شوێنەوە بۆ پاراستنیان لەیەکتری و کەمکردنەوەی زەبریان لەسەر یەکتری.
(٣) ناوچەی بێ لایەن (کە دوو لەشکر یا تاقمی ناحەز بەیەك لەیەکتری جیادەکاتەوە)؛ ناوچەی بەربەست.

***v.t.*** کەمکردنەوەی زەبر.

**buffer** (buf′ēr), ***n.*** (١) شتی ساف‌ولووسکەر (قوماشی نەرم، پێچکەی لە چەرم گیراو). (٢) مرۆڤی ساف‌ولووسکەر.

**buffer state,** وولاتی بەربەست یا ناوبەین: وولاتێکی بێ لایەنە لەنێوان دوو وولاتی گەورەتری ناحەز بەیەکدا لەیەکیان جیادەکاتەوە تا شەر نەکەن.

**buffer zone,** ناوچەی بەربەست: ناوچەی بێ لایەن کە دوو لەشکری ناحەز بەیەك یا دوژمن بەیەك لەیەکتری جیادەکاتەوە.

**buffet** (buf′it), ***n.*** زللە؛ شەپازلە؛ مستەکوڵە؛ لێدان (مەجاز):

*( the ~s of fate)*

***v.t.*** (١) زللە لێدان؛ مستەکوڵە لێدان؛ پیاماڵین؛ پیاکێشان.
(٢) بەرهەڵستی کردن؛ پاڵ پێوەنان و گەڕاندنەوە؛ پیادان:

*( The waves ~ed the boat.)*

***v.i.*** (١) زۆران لەگەڵ گرتن؛ شەڕ لەگەڵ کردن.
(٢) رێگەکردنەوە (بە زۆر یا بە پیاماڵین).

**buffet** (bə-fā′, boo-fā′), ***n.*** (١) دۆڵابی کەل‌وپەلی چێشتخانە.
(٢) بوفێ: (ا) مێزێکە خواردەمەنی و ساردەمەنی لەسەر دادەنرێت، میوانەکان بە پێوە بەشی خۆیان دەبەن و دەیخۆن.
(ب) مێزێکی وەها لە چێشتخانەدا.
(٣) بوفێ: ژەمێکە کە میوانەکان بەشی خۆیان دەبەن لەو خواردن و خواردنەوەیەی لەسەر مێزێك دانراوە.

**buffet supper** (or **lunch**), ژەمەنانی بوفێی ئێوارە یا نیوەڕۆ.

**buffing wheel,** پێچکەی ساف‌ولووس کردن (لە چەرم یا قوماش گیراوە).

**bufflehead** (buf′'l-hed′), ***n.*** مراوییەکی پشت رەشی ژێرسك سپی سەر زلی ئەمەریکای باکوورە.

**buffo** (bōō′fō), ***n.*** گۆرانی بێژی قۆشمەی ئۆپەرا.

***adj.*** قۆشمە.

**buffoon** (bu-fōōn′), ***n.*** قەشمەر؛ قۆشمەچی؛ گاڵتەچی.

**buffoonery** (bu-fōōn′ēr-i), ***n.*** قۆشمەچێتی؛ گاڵتەچێتی؛ گاڵتەوگەپ.

**bug** (bug), ***n.*** (١) مێرووی زیانبەخش؛ مێروو؛ جانەوەر.
(٢) [Colloq.]، میکرۆب.
(٣) [Slang]، مایکرۆفۆنێکی زۆر بچووکە لە شوێنێکدا دەشاررێتەوە بۆ تۆمارکردنی گفتوگۆ بەدزییەوە.
(٤) [Slang]، کەم‌وکووڕی مەکینە یا ئامێرێك.

***v.t.*** (١) شاردنەوەی مایکرۆفۆنی بچووك لە شوێنێکدا بۆ تۆمارکردنی گفتوگۆ بەدزییەوە: *( to ~ a room, telephone, etc.)* .
(٢) پەستکردن؛ سەرخستنەسەر؛ تووڕەکردن:

*( You're ~ging me. ; Don't ~ him.)*

bug off, [Slang], لاچۆ لێرە؛ لاچۆ!

**bug** (bug), ***n.*** [Obs.], = **bugbear.**

**bugaboo** (bug′ə-bōō′), ***n.*** (١) دێوودرنج؛ دەعبا؛ شەولەبان.
(٢) سەرچاوەی ترس یا مەراق.
(٣) بیروباوەڕێکی درۆیە خەڵکی پێ دەترسێنرێت یا پێ دەهێنرێتە سەر

ڕێگەیەکی تایبەتی.
**bugbear** (bug′bâr′), *n.* = **bugaboo.**
**bugger** (bug′ẽr), *n.* (١) هەتیوباز
(٢) لۆتی؛ کەسێکی پیس و بۆگەن؛ کەسێکی بێ نرخ
(٣) کوڕە (لەڕووی خۆشەویستییەوە یا گاڵتەوە)؛ منداڵ؛ لاو.
*v.t.* گاین؛ نێرگاین
**buggery** (bug′ẽr-i), *n.* هەتیوبازی؛ نێرگاین
**buggy** (bug′i), *n.* (١) گالیسکەیەکی یەك ئەسپی یەك کەسییە.
(٢) عەرەبانەی منداڵ
**buggy** (bug′i), *adj.* پڕ لە مێروو؛ جانەوەراوی؛ مێرووتێداو.
**bughouse** (bug′hous′), *n.* [Slang], شێتخانە
*adj.* [Slang], شێت
**bugle** (bū′g'l), *n.* (١) کەڕەنا (٢) کەنەشاخێکە فووی پیادەکرێت (راو).
*v.i. & v.t.* فوو بە کەرەنادا کردن؛ بانگ کردن بە کەرەنا.
**bugle** (bū′g'l), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکە لە توخمی پونگە
**bugle** (bū′g'l), *n.* مووروویەکی شووشەی درێژکۆڵەی ڕەشە.
**bugler** (bū′glẽr), *n.* (١) کەرەناژەن؛ فووکەر بە کەرەنادا.
(٢) سەرباز ی دیدەوانی فووکەر بە کەرەنادا (بۆ خەڵك بانگ کردن).
**bugloss** (bū′glos, bū′glôs), *n.* زمانی گا: چەند جۆرە ڕووەکێکی گوڵ ڕەنگین و گەڵا و قەفی دڕکاوین.
**buhl** (bōōl), *n.* (١) ڕازاندنەوەی کەلوپەلی ناوماڵ بە نەخشی کونچکە- ماسی و کانز ی ڕەنگاورەنگ و سەدەف
(٢) کورسی و مێز و شتی داربنەی تری ڕازاوە بەم شێوەیە.
**buhrstone** (bũr′stōn′), *n.* (١) بەردێکی سەختە (دەستاری لێ دروست دەکرێت) (٢) دەستار.
**build** (bild), *v.t.* (١) دروستکردن؛ دامەزراندن.
(٢) دانان؛ دامەزراندن: *( B~ your theory on facts.)*.
(٣) هێنانەڕوو
*v.i.* (١) خانوو دروستکردن (٢) خانووسازی کردن بە پیشە.
(٣) ( on; ~ upon ~)، نەخشەدانان. (٤) پێرکردن (یاری کاغەز).
*n.* قەدوباڵا؛ لەش *( an athletic ~ ; a stocky ~ )*.
**build up,** (١) بەرەبەرە دروستکردن؛ وورد‌ەوورد‌ە دامەزراندن یا پێکەوەنان. (٢) تەندروستی باش کردن؛ بەهێزکردن. (٣) ئاوەدانکردنەوە.
**builder** (bil′dẽr), *n.* (١) دروستکەر؛ دامەزرێنەر؛ دانەر.
(٢) خانووساز؛ وەستای خانوو؛ خانووکەر.
(٣) ماددەیەکە دەکرێتە ناو سابوونەوە بۆ باشتر شتن.
**building** (bil′diŋ), *n.* (١) خانوو
(٢) دروستکردن (خانوو، کەشتی... هتد).
**build-up** (bild′up′), *n.* [Slang], بە شان و باڵدا هاتنەخوارەوە؛ جاڕ یا پروپاگەندەی لایەنگر.
**built** (bilt), *past tense and p.p. of* **build.**
**built-in** (bilt′in′), *adj.* لەناودا دروستکراو یا چەسپێنراو؛ لەناو شتەکەدا دروستکراوە و بەشێکە لە شتەکە:
*( a ~ microphone, bathtub, etc.)*
**bulb** (bulb), *n.* (١) گڵۆپ (کارەبا) (٢) فیسقە؛ پیازۆکە؛ سەلك؛ ڕەگی ڕووەك و گوڵەباخ کە لە پیازۆکە دەچێت و دەڕوێنرێت.
**bulbaceous** (bul-bā′shəs), *adj.* (١) پیازۆکەیی؛ فیسقەیی.
(٢) فیسقەدار؛ لە پیازۆکەوە گەورەبوو.
**bulbar** (bul′bẽr), *adj.* پیازۆکەیی؛ فیسقەیی
**bulbiferous** (bul-bif′ẽr-əs), *adj.* فیسقە هێنەرە بەرهەم؛ پیازۆکەگر
**bulbil** (bul′bil), *n.* فیسقەی بچووك؛ پیازۆکە
**bulbous** (bul′bəs), *adj.* (١) فیسقەیی؛ فیسقەدار.
(٢) لە فیسقە یا پیازۆکەوە پەروەردەکراو.
**bulbul** (bool′bool), *n.* بولبول.

**bulge** (bulj), *n.* ئاوسان؛ ئاوساوی؛ بلۆق؛ تلۆق؛ کیس.
*v.i. & v.t.* ئاوسان؛ بلۆق کردن؛ دەرپەڕین؛ هەڵتلۆقین؛ کیس کردن؛ هەڵتۆقین؛ خوێن یا ئاو تێزان.
**bulgy** (bul′ji), *adj.* ئاوساو؛ هەڵتلۆقیو؛ بلۆق کردوو.
**bulimia** (bū-lim′i-ə), *n.* برسێتییەکی لە ئەندازە بەدەری بەردەوام (پزیشکەوانی).
**bulk** (bulk), *n.* (١) قەبارە (بەتایبەتی هی زۆر گەورە)؛ قەبەیی.
(٢) زۆربە؛ زۆرینە:
*( He invested the ~ of his money in real estate.)*
(٣) باری کەشتی.
*v.i.* (١) کەڵەکەبوون؛ تۆپەڵ بوون؛ کۆمەڵ بوون.
(٢) گەورەبوون؛ زل بوون؛ زیادبوون (گرنگی، بایەخ).
(٣) گرنگ بوون؛ بایەخ هەبوون؛ قەبارە هەبوون.
*v.t.* کەڵەکەکردن؛ تۆپەڵ کردن؛ کۆمەڵ کردن.
*adj.* (١) سەرجەم؛ کۆ؛ هەموو.
(٢) نەکراوەتە کیسە و پاکەت و سنووقەوە بەڵکو بە کۆمەڵ دانراوە (فرۆتەنی).
**break bulk,** بار شکاندن (بە لێ دزینەوەی هەندێکی).
**in bulk,** (١) بە کۆمەڵ؛ نەکراوەتە پاکەت و کیسە و سنووقەوە بەڵکو بە کۆمەڵ دانراوە (فرۆتەنی).
(٢) زۆر؛ بڕێکی زۆر؛ بە کۆمەڵ: *( He buys mechandise in bulk.)*
**bulkhead** (bulk′hed′), *n.* (١) تیغەدیواری ناو کەشتی و شتی تر.
(٢) بەربەست؛ دیوار (بۆ ڕاگرتن یا بەربەست کردنی زەوی، ئاگر، ئاو).
(٣) چوارچێوەیەکی دەرپۆقیوە بۆ دەرگایەکی پێ پلیکانەی گەنجینەی ژێرزەمین.
**bulkiness** (bul′ki-nis), *n.* زلی؛ گەورەیی؛ قەبارە.
**bulky** (bul′ki), *adj.* (١) بە قەبارە؛ قەوارەدار؛ زل؛ گەورە.
(٢) قەبە؛ ناقۆڵا؛ زل و ناقۆڵا.
**bull** (bool), *n.* (١) کەڵەگا؛ گای نەخەساو.
(٢) نێرینەی گامێش، فیل، بەرانەکێوی، نەهەنگ... هتد.
(٣) پارەباز؛ ئاڵوێرکەری بۆرسە.
(٤) کەسێکی باشبین (پارەبازی، بازرگانی، کاسبی).
(٥) [B-]، بورجی گا.
(٦) کەسێکی کەتە و بەهێز و دەنگ زل.
(٧) [Slang]، قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا.
*v.t.* نرخ زیادکردنی بۆرسە (پارەبازی).
*v.i.* نرخ زیادبوونی بۆرسە؛ نرخ زیادبوون.
*adj.* (١) نێرینە؛ نێر. (٢) کەڵەگایی؛ کەتە و بەهێز.
(٣) نرخی لە زیادبووندایە؛ لە برەودایە: *( a ~ market)* .
**shoot the bull,** [Slang], (١) قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا کردن؛ قسەی قۆڕکردن. (٢) قسەکردن؛ دەمەتەقێ کردن.
**take the bull by the horns,** بە ئازایانە و چاونەترسانە بەرەنگاری کێشە یا تەنگوچەڵەمە بوون.
**bull** (bool), *n.* (١) مۆری پاپا. (٢) فەرمانی پاپا؛ فەرمانێکی پاپایی.
**bull** (bool), *n.* هەڵەی ڕووتار؛ ووتەی نابەجێ یا هیچ‌وپووچ و بێ مانا.
**bull-** (bool), پێشگرێکە بەمانای: (١) گا؛ کەڵەگا: *(bullfight)* .
(٢) وەك کەڵەگا.
(٣) نێرینە؛ زل: *(bullfrog)* .
**bulla** (bool′ə, bul′ə), *n.* (١) مۆرێکی خڕی قوڕقوشمی پاپایە.
(٢) بلۆق؛ تلۆق؛ ئاوساوی.
**bullace** (bool′is), *n.* (١) هەڵووژە؛ هەڵووژە کێوی.
(٢) دارهەڵووژە؛ داری هەڵووژە کێوی.
**bullate** (bool′it, bul′it), *adj.* بلۆقاوی یا گرنج گرنجاوی (گەڵای توخمە کەلەرمێك).
**bullbaiting** (bool′bāt′iŋ), *n.* ڕاوەگا؛ سەگ کردنە کەڵەگا (جاران لە ئینگلتەرە باوبوو).

**bullbat** (bool′bat′), *n.* = nighthawk.
**bulldog** (bool′dôg′, bool′dog′), *n.* (١) سەگێکی گەورەی کەللە زل تووك کورتی ناشرینی بەهێزو ئازایە. (٢) دەمانچەیەکی لووت کورتە.
(٣) ماددەیەکی گرنەگرە لە فڕن درووستکردندا بەکاردەهێنرێت.
(٤) [British]، چاودێری ڕەووشت باشی (لە هەندێك لە زانکۆکانی ئینگلتەرەدا)؛ پۆلیس.
*adj.* وەك سەگی " بولدۆگ " ئازا؛ سەرسەخت؛ کەللەڕەق.
*v.t.* بەزەویدادانی پارێنێك بە دەست گرتن بە شاخییەوەو بادانی ملی.
**bulldog edition,** چاپی بەیانی زووی ڕۆژنامەیەك بۆ دەرەوەی شار.
**bulldoze** (bool′dōz′), *v.t.* (١) ڕووخاندن بە بولدۆزەر.
(٢) بەچەترسێن کردن؛ ترساندن.
**bulldozer** (bool′dōz′ẽr), *n.* (١) بولدۆزەر مەکینەی زەوی ڕامالین و هەڵکەندن. (٢) تیغی بولدۆزەر. (٣) شەلاتی؛ شەقاوە.
**bullet** (bool′it), *n.* گوللە؛ فیشەك
**bulletin** (bool′ə-t′n, bool′ə-tin), *n.* (١) (أ) بلاوکراوەی ڕەسمی؛ هەواڵنامە؛ بەیاننامە؛ ئامۆژگاری. (ب) بلاوکراوە؛ دوا دەنگوباس.
(٢) گۆڤاری کۆمەڵە یا ڕێکخراوێك.
*v.t.* بلاوکردنەوە (لە بلاوکراوە، ئامۆژگاری، یا گۆڤاردا).
**bulletin board,** تەختەی ئاگاداری.
**bulletproof** (bool′it-prōōf′), *adj.* گوللەبەند؛ گوللەنەبڕ.
*v.t.* گوللەبەندکردن.
**bullfight** (bool′fīt′), *n.* شەڕەگای ئیسپانی
**-bullfighting** *(n.).*
**bullfighter** (bool′fīt′ẽr), *n.* شەڕەگاکەر
**bullfinch** (bool′finch′), *n.* چەند جۆرە باڵندەیەکی چۆلەکە ئاسایی ڕەنگاوڕەنگی دەنگ خۆشن.
**bullfinch** (bool′finch′), *n.* پەرژینێکی بەرز (کە خەنەقێك لە دیوێکییەوە بێت).
**bullfrog** (bool′frôg′, bool′frog′), *n.* جۆرە بۆقێکی گەورەیە
**bullhead** (bool′hed′), *n.* (١) جۆرە ماسییەکی سەرزلە.
(٢) کەسێکی سەرسەخت یا کەللەڕەق.
**bullheaded** (bool′hed′id), *adj.* (١) سەرزل؛ کەللەزل؛ سەرپان.
(٢) کەللەڕەق؛ سەرسەخت.
**bullhorn** (bool′hôrn′), *n.* دەنگ گەورەکەر
**bullion** (bool′yən), *n.* (١) پارچە زێڕ یا زیو.
(٢) پەراوێزو نەقش‌ونیگاری زێڕین یا زیوین.
**bullish** (bool′ish), *adj.* (١) کەڵەگاسی؛ سەرپان و کەللەڕەق.
(٢) (أ) هێزی نرخ بەرزکردنەوە؛ نرخ بەرزکەرەوە.
(ب) لە نرخ بەرزبوونەوەدایە (پارەبازی، بۆرسە): *( a ~ market)* .
(ج) باشبێژ (پارەبازی، بازرگانی، کاسبی).
**bullnecked** (bool′nekt′), *adj.* مل کورت و ئەستوور.
**bullock** (bool′ək), *n.* (١) گاجووت؛ گای خەساو؛ گا.
(٢) [Obs.]، پارێن.
**bull pen,** (١) پەچەی کەڵەگا؛ تەویلەی کەڵەگا
(٢) گرتووخانەی سەردەمی (٣) مەشقگای یاری بێیسبۆل.
**bull ring,** گۆڕەپانی شەڕەگای ئیسپانی؛ مەیدانی شەڕەگا
**bull-roarer** (bool′rôr′ẽr), *n.* بۆڕەدار پارچەیەك تەختەیە بەستراوە بە پەتێکەوە کە بە قایم بادرا دەنگێکی گەورەی لێوەدێت.
**bull session,** [Colloq.], کۆڕی دەربڕینی بیروڕا بە ئاشکرا.
**bull's-eye** (boolz′ī′), *n.* (١) کلاوڕۆژنە.
(٢) ناوەڕاستی نیشانێك؛ ناوجەرگەی نیشان (تیربازی).
(٣) پێکان؛ لێدان؛ لێدانێکی ڕاستەوخۆ؛ لێدانی ناوەڕاستی نیشان.
(٤) کارێکی سەرکەوتوو. (٥) شووشەی قۆقز.
(٦) چرایەك کە شووشەی وەهای هەبێت. (٧) جۆرە نوقوڵێکی ڕەقە.
(٨) خولخولۆکەی دارین (کەشتییەوانی).

**bullshit** (bool′shit′), *n.* [Vulgar Slang], قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا؛ قسەی قۆڕ.
*v.i.* [Vulgar Slang], قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا کردن؛ قسەی قۆڕ کردن.
**-bullshitter** *(n.).*
**bull terrier,** جۆرە سەگێکی بەهێزی باریکەلەی سپی خێرای تووك کورتی پێست سافە.
**bull tongue,** گاسن؛ دەمەگاسن.
**bull-whip** (bool′hwip′), *n.* قامچی درێژو ئەستوور.
**bully** (bool′i), *n.* (١) سێبەندی؛ شەلاتی؛ زەبوون کوژ.
(٢) گەواد. (٣) [Archaic]، پیاوکوژ یا شەلاتی بە کرێ گیراو.
(٤) [Archaic]، کابرایەکی چاك.
*v.t.* بەچەترسێن کردن؛ ترساندن: *( to ~ somebody)* .
*v.i.* سێبەندیتی کردن.
*adj.* (١) ئازا؛ چاونەترس؛ چاوقایم. (٢) [Colloq.]، زۆرباش.
*interj.* [Colloq.], ئافەرم!؛ دەستخۆش!.
**bully** (bool′i), *n.* گۆشتی قووتووی گا.
**bullyrag** (bool′i-rag′), *v.t.* بەچەترسێن کردن؛ هەڕەشەلێکردن؛ ترساندن.
**bulwark** (bool′wẽrk), *n.* (١) سەنگەر؛ قەلا. (٢) breakwater .
(٣) پارێزەر (شت)؛ پارێزگار: *( Law is the ~ of society.)* .
(٤) *(pl.)*، دیواری سەربانی کەشتی.
*v.t.* پاراستن؛ بەربەست کردن؛ پارێزگاری کردن.
**bum** (bum), *n.* (١) [Colloq.]، کەسێکی وێڵ و بێ لانەو دەست لە خەڵك پان کەرەوە. (٢) کەسێکی تەمەڵ و بێ کارو کاسبی (هەندێك جار لەڕووی گاڵتەوە)؛ مفتخۆر؛ مووشەك؛ لاخۆر؛ جادەپێو.
(٣) کەسێکی سەرسەری یا بێ نرخ. (٤) [Slang]، زەماوەندی خواردنەوە.
*v.i.* (١) [Colloq.]، سووڕانەوە؛ جادە پێوان.
(٢) [Colloq.]. مفت خواردن؛ مووشەکی کردن.
(٣) [Slang]، زۆر خواردنەوە.
*v.t.* مفت خواردن؛ دەست لە خەڵك پان کردنەوە.
*adj.* (١) خراپ؛ قەڵب؛ بازاڕی.
(٢) شکاو؛ لەکارکەوتوو؛ پەککەوتوو: *( a ~ shoulder)* .
on the bum, [Colloq.], (١) سووڕانەوە؛ جادە پێوان.
(٢) شکاو؛ پەککەوتوو.
**bum** (bum), *n.* [British Slang], گووپی قنگ؛ قنگ.
**bumble** (bum′b'l), *v.i.* ووزەووزکردن؛ گیزەهاتن.
**bumble** (bum′b'l), *v.i.* (١) زمان گیران؛ بە ناقۆلایی ڕەفتارکردن.
(٢) سانتەمەدان؛ پێ داچوون؛ چورتم دان.
*v.t.* تێکدان (کار)؛ بە نارێك‌وپێکی کردن.
**bumblebee** (bum′b'l-bē′), *n.* هەنگێکی گەورەی گیزە زلە.
**bumboat** (bum′bōt′), *n.* بەلەمی ئازووقەبەر (بۆ کەشتی گەورە کە ناتوانن زۆر نزیك بەندەر ببنەوە).
**bump** (bump), *v.t.* (١) خۆ پیادان؛ پیادان؛ بەرکەوتن (بە ئەسپایی یا قایم). (٢) لێسەندن و دان بە کەسێکی تر (کار، جێگەی ناو فڕۆکەو شەمەندەفەر)؛ لابردن و جێگەگرتنەوە؛ دەرکردن لە کار.
*v.i.* (١) ( ~ into; ~ against )، بەرکەوتن؛ خۆ پیادان؛ پێ گەیشتن؛ تووش بوون: *( He ~ed into her. ; He ~ed against the wall.)* .
(٢) تاسەکردن؛ هەڵبەزودابەزکردن
*n.* (١) قۆرت؛ کۆسپ: *( to hit a ~ )* .
(٢) تاسە؛ هەڵبەزودابەز. (٣) پیادان؛ بەرکەوتن.
(٤) بلۆق؛ تلۆق؛ ئاوساوی.
bump off, (١) بەرکەوتن و خستنەخوارەوە (لەسەر مێزێك).
(٢) [Slang]، کوشتن؛ سل ساردکردنەوە.
**bumper** (bump′ẽr), *n.* دەعامیەی ئۆتومبیل
**bumper** (bump′ẽr), *n.* (١) پەرداخ یا کووپی زۆر پڕ؛ جامی لێواولێو

(٢) شتێکی زۆر زل

***v.t.*** (١) لێواولێو کردن؛ زۆر پڕکردن.

(٢) بە نۆشی کەسێکەوە خواردنەوە.

***adj.*** فرە؛ بێ شومار؛ زۆر؛ زەبەنە: ***(a ~ crop)***.

**bumpkin** (bump′kin), ***n.*** (١) لادێیی؛ کەسێکی هیچ نەزان؛ کەسێکی ناقۆڵا و گێلۆکەو تێنەگەیشتوو: ***(a country ~)***.

(٢) دارێکی دەرپۆقیوە لەدوای کەشتییەوە بۆ ڕاگیرکردنی تەوەر.

**bumptious** (bump′shəs), ***adj.*** زۆر لەخۆبایی؛ زۆر بەفیزو کەشخە.

**bumpy** (bump′i), ***adj.*** کەندوکۆسپاوی؛ چاڵوچۆڵاوی؛ پڕ لە تاسە: ***(a ~ road)***

**bun** (bun), ***n.*** (١) (ا) پارچە نانی نەستوور (وەك سەموون بەڵام بچووکتر).

(ب) پارچە نانی نەستووری نەختێك شیرین کراو. (٢) پرچی کڵافەکراو.

**bunch** (bunch), ***n.*** (١) هێشوو ***(a ~ of grapes)***.

(٢) چەپك؛ قول؛ دەسك (گوڵ، گیا)؛ گورزە؛ مەڵۆ: ***(a ~ of flowers)***.

(٣) دەستە (کلیل): ***(a ~ of keys)***.

(٤) [Rare]. کۆپارە؛ قەمووری.

(٥) [Colloq.]. دەستە (مرۆڤ)؛ تاقم (شت، مرۆڤ)؛ هەند: ***(a ~ of people, trees, etc.)***

***v.t. & v.i.*** (١) دەستەدەستەکردن؛ کردن بە چەپك یا دەسك؛ پێکەوەبەستن.

(٢) توێ توێ وەستان پێکەوە (تەنوورە یا کراسی ژنانە).

**-bunchy** ***(adj.)***.

**bunco** (buŋ′kō), ***n.*** [Colloq.], گزی (یاری کاغەز. هایبەخت)؛ ساختە.

***v.t.*** [Colloq.], گزی کردن؛ ساختەکردن.

**buncombe** (buŋ′kəm), ***n.*** [Colloq.], (١) ووتاری هیچوپووچ (کە هەر بۆ ڕازی کردنی جەماوەر بێت). (٢) قسەو کردەوەی قۆڕ؛ قسەی پووچ.

**bund** (bund), ***n.*** (١) بەستوو؛ بەست؛ بەنداو.

(٢) شەقام یـ ڕێڕەوی قەراغ بەندەر.

**bund** (bund), ***n.*** (١) ڕێکخراو؛ کۆمەڵە؛ یەکێتی.

(٢) [B-]. کۆمەڵەیەکی ئەڵمانی-ئەمەریکی نازییە.

**bundle** (bun′d'l), ***n.*** (١) چەپك؛ دەسك؛ قول؛ گورزە؛ مەڵۆ.

(٢) پڕپاسکە؛ بابۆڵە. (٣) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ.

(٤) [Slang]، سەفتە؛ پارەیەکی زۆر: ***(He spent a ~.)***.

***v.t.*** (١) پێکەوەبەستن؛ پێچانەوە؛ دەستەدەستەکردن؛ چەپك چەپك کردن.

(٢) (~ away; ~ off; ~ out)، بە پەلە ناردن؛ دەست پێوەنان بە گورج.

***v.i.*** (١) (~ away)، بە پەلە ڕۆیشتن؛ خێرا بۆ دەرچوون.

(٢) لەگەڵ یاردا نووستن لە هەمان جێگەدا بە جلەوە.

**bundle up,** جلی گەرم لەبەرکردن؛ خۆ گەرم داپۆشین.

**bung** (buŋ), ***n.*** (١) تەپەدۆر. (٢) کونی بە تەپەدۆر گیراو.

***v.t.*** (١) کون گرتن بە تەپەدۆر. (٢) داخستن؛ گرتن (کون).

(٣) [Slang]، (~ up)، بریندارکردن؛ ڕووشاندن؛ شین کردنەوە.

**bungalow** (buŋ′gə-lō′), ***n.*** خانوویەکی بچووکی یەك نهۆمییە؛ بەنگەڵە

**bunghole** (buŋ′hōl′), ***n.*** کونی بەرمیل یا مەرکانە

**bungle** (buŋ′g'l), ***v.t. & v.i.*** بە خراپی کردن یا پینەکردن؛ تێکدان؛ بە ناشرینی و نەزانانە کردن؛ خەسارکردن: ***(to ~ a job)***.

***n.*** کارێکی بە نەزانانە کراو؛ کارێکی قەڵب یا خراپ کراو.

**bunion** (bun′yən), ***n.*** بلۆقی بنی پەنجەگەورەی پێ.

**bunk** (buŋk), ***n.*** (١) جێگەی نووستنی بە قەد دیوارەوە (لە کەشتیو شەمەندەفەردا). (٢) جێگەیەکی نووستنی تەسك؛ دوو چەرپایەی تەسکی بەسەریەکەوە لەیەك چوارچێوەدا.

***v.i.*** (١) نووستن لە جێگەیەك یا چەرپایەیەکی تەسکدا. (٢) نووستن؛ خەوتن.

**bunk** (buŋk), ***n.*** [Slang], قسەی هیچوپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ مانا.

**bunkbed** (buŋk′bed′), ***n.*** دوو چەرپایەی تەسکە لەناو یەك چوارچێوەی داردا بەسەر یەکەوە.

**bunker** (buŋ′kẽr), ***n.*** (١) عەماری خەڵوز یا سووتەمەنی کەشتی.

(٢) سەنگەر؛ ژوورێکی کۆنکریتی ژێرزەمین (جەنگ).

(٣) گردۆڵکەیەکی لمە لە یاریگەی "گۆڵف" دا.

***v.t.*** (١) خەڵوز یا سووتەمەنی کردنە کەشتییەوە.

(٢) لێدانی تۆپی "گۆڵف" و کەوتنی لەناو گردۆڵکەی لمینی ناو یاریگاکە.

**bunkhouse** (buŋk′hous′), ***n.*** خانوویەکی ساکارە کە چەند چەرپایەیەکی تەسکی تێدایە.

**bunkmate** (buŋk′māt′), ***n.*** هاوجێگە (لە یەکێك لە دوو چەرپایەی تەسکی ناو چوارچێوەیەکی دار).

**bunko** (buŋ′kō), ***n.*** = **bunco.**

**bunkum** (buŋ′kəm), ***n.*** = **buncombe.**

**bunny** (bun′i), ***n.*** (١) کەروێشك (ووشەیەکی مندالانە)؛ کەروێشکی ماڵی. (٢) کچی بەردەستی هەندێك یانەی شەو (کە جل کەم لەبەردەکەن و خۆیان وەك کەروێشك دەنوێنن).

**bunt** (bunt), ***v.t. & v.i.*** (١) شۆق لێدان؛ قۆچ تێهەڵدان.

(٢) لێدانی تۆپی بێسبۆڵ بە ئەسپایی.

***n.*** (١) شۆق؛ قۆچ. (٢) لێدانی تۆپی بێسبۆڵ بە ئەسپایی.

**bunt** (bunt), ***n.*** (١) نەخۆشی گەنم. (٢) میکرۆبی ئەم نەخۆشییە.

**bunt** (bunt), ***n.*** (١) ناوەڕاستی تۆڕی ماسی داکەوتوو.

(٢) ناوەڕاستی بایەوانی کەشتی با.

**bunting** (bun′tiŋ), ***n.*** (١) قوماشی ئاڵا. (٢) ئاڵا؛ بەیداخ.

(٣) ئاڵا و پارچە قوماشی بچووکی ڕەنگاوڕەنگ (کە شەقام و شوێنی تری پێ دەڕازێنرێتەوە لە جەژندا).

**bunting** (bun′tiŋ), ***n.*** باڵندەیەکی دەنووك ئەستوورە لە چۆلەکەو فیسقەکولە دەچێت

**buntline** (bunt′lin, bunt′līn), ***n.*** پەتی بنی بایەوانی کەشتی.

**buoy** (boi, bōō′i), ***n.*** (١) دەبەی سەرئاو (لە بەندەرو کەناری دەریادا دانرێت بۆ نیشانەکردنی تەنکایی ئاو).

(٢) چاکەتی سەرئاوخەر (بۆ ڕزگارکردن لە خنکاندن).

***v.t.*** (١) نیشانەکردن بە دەبەی سەرئاو. (٢) سەرئاوکەوتن.

(٣) هاندان؛ وورە نانەبەر؛ کەیف خۆش کردن.

**buoyancy** (boi′ən-si, bōō′yən-si), ***n.*** (١) سەرئاوکەوتن؛ توانای سەرئاوکەوتن؛ سووکی. (٢) ڕووخۆشی؛ کەیف خۆشی.

**buoyant** (boi′ənt, bōō′yənt), ***adj.*** (١) سەرئاوکەوتوو؛ سووك.

(٢) سەرئاوخەر. (٣) کەیف قنج؛ زیت: ***(a ~ personality)***.

**bur, burr** (bũr), ***n.*** (١) پەیکولە؛ دڕکێکی خڕی بچووکە.

(٢) ڕووەکێك کە ئەم دڕکە دەگرێت. (٣) کەسێکی خۆهەڵواسەر بە خەڵکەوە

***v.t.*** پەیکولە لێکردنەوە.

**burble** (bũr′b'l), ***v.i.*** بڵقە بڵق کردن (وەك ئاوی شەربەو گۆزە).

**burbot** (bũr′bət), ***n.*** جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە.

**burden** (bũr′d'n), ***n.*** (١) بار؛ کۆڵ؛ باری سەرشان.

(٢) باری گران؛ ئەرك؛ کۆڵێکی قورس؛ تەوق؛ ئەرکی ناخۆش.

(٣) بارهەڵگرتن: ***(a beast of ~)***.

(٤) باری کەشتی؛ ئەو بارەی کەشتییەك بۆی هەڵدەگیرێت.

***v.t.*** بار قورس کردن؛ بار گران کردن؛ ئەرك خستنەسەر؛ سەر قورس کردن: ***(Don't ~ him with your troubles.)***

**burden** (bũr′d'n), ***n.*** (١) کۆرەسی گۆرانی.

(٢) نزمترین دەنگی پارچەیەك مۆسیقای ئۆرکێسترا.

(٣) دەنگی شمشاڵی نیرلەندی (کە هەر دەیلێتو دەیلێتەوە).

(٤) بیری سەرەکی ووتارێك: ***(the ~ of a speech)***.

**burden of proof,** ئەرکی پێ سەلماندن (کە وا لەسەر شانی کەسێك یا کۆمەڵێك بۆ پێ سەلماندنی داواکەیان ئەگەرنا دۆڕاندنی).

**burdensome** (bũr′d'n-səm), ***adj.*** قورس؛ گران؛ ناخۆش؛ ماندووکەر: ***(~ requests, restrictions, etc.)***.

**burdock** (bũr′dok′), ***n.*** ڕووەکێکی بۆن تیژی گەڵا زلە دڕکی

قولاپداری پێوەیە بە شتەوە دەنووسێت.

**bureau** (byoo′rō), *n.* (١) [British]، مێزی نووسینی چەکمەجەدار.
(٢) دۆلاب (بۆ جل‌وبەرگ).
(٣) فەرمانگە؛ دەزگا: *( an information ~ ; a travel ~ )* .
(٤) فەرمانگەی میری

**bureaucracy** (byoo-rok′rə-si), *n.* بیرۆکراسی (أ) ڕژێمی
بەڕێوەبردنی کاروباری میری لەلایەن کاربەدەستانی هەڵنەبژێراوەوە.
(ب) سەرجەمی ئەم کاربەدەستانە؛ فەرمانبەرانی میری.
(ج) ڕۆتینی ووشك‌و بێ مانای دەزگاو فەرمانگەکانی میری.

**bureaucrat** (byoo′rə-krat′), *n.* بیرۆکرات کاربەدەستێکی میری
کوێرانە لەسەر ڕۆتین ڕۆیشتوو.

**bureaucratic** (byoo′rə-krat′ik), *adj.* بیرۆکراتی تایبەتی بە
ڕۆتینی ناو دەزگاو فەرمانگەکانی میری.

-bureaucratically *(adv.).*

**Bureau of Internal Revenue,** دەزگای باجی دەسکەوت.

**burette, buret** (byoo-ret′), *n.* شووشەی پەلەپلە نیشانەکراوی
کیمیاگەری بۆ پێوانی شلە بەکاردەهێنرێت

**burg** (bũrg), *n.* (١) شاری بە دیوار دەورەگیراوی کۆن.
(٢) شار؛ دێ

**-burg** (bũrg), پاشگرێکە بەمانای شار؛ ئاوەدانی.

**burgage** (bũr′gij), *n.* شێوەیەکی بەکرێدانی زەوی‌وزارە

**burgee** (bũr′jē), *n.* ئاڵای سێگۆشەیی پێناسەی کەشتی.

**burgeon** (bũr′jən), *v.i. & v.t.* (١) چرۆکردن؛ چەکەرەکردن؛
پشکوتن. (٢) پەرەسەندن؛ پێگەیشتن؛ گەشەکردن؛ تەرزفڕێدان.

*n.* خونچە؛ چرۆ؛ تەرز؛ گوڵ.

**-burger** (bũr′gẽr), پاشگرێکە بەمانای ساندویچی گۆشتی قیمەکراو
*(hamburger, cheeseburger)*

**burgess** (bũr′jis), *n.* (١) دانیشتوویەکی شارێکی ئینگلیزی.
(٢) نوێنەری شارێکی ئینگلیزی یا زانکۆیەك لە پەرلەماندا.
(٣) ئەندامێکی پەرلەمانی ویلایەتی " ماریلاند " لە ئەمەریکا پێش شۆڕشی
ئەمەریکی

**burgh** (bũrg), *n.* شارێکی ئینگلیزی یا ئوسکوتلەندی سەربەخۆ.

**burgher** (bũr′gẽr), *n.* دانیشتووی شارێکی ئینگلیزی یا
ئوسکوتلەندی سەربەخۆ.

**burglar** (bũr′glẽr), *n.* دزی ماڵ یا دووکان؛ دز؛ ماڵبڕ.

-burglarious *(adj.).*

**burglarize** (bũr′glə-rīz′), *v.t.* ماڵ یا دووکان بڕین؛ دزین.
*( to ~ a home, shop, office, etc.)*

**burglarproof** (bũr′glẽr-prōōf′), *adj.* نادزرێت (ماڵ، دووکان)؛
دز ناتوانێت بیبڕێت.

**burglary** (bũr′glə-ri), *n.* ماڵ یا دووکان بڕین؛ دزین؛ تاڵان کردن.

**burgle** (bũr′g'l), *v.i. & v.t.* = **burglarize.**

**burgomaster** (bũr′gə-mas′tẽr), *n.* سەرۆکی شارەوانی (لە
هۆڵەندەو ئەڵمانیاو ئەمسا).

**burgonet** (bũr′gə-net′), *n.* کڵاوی ئاسنی سووك

**burgoo** (bũr′gōō, bẽr-gōō′), *n.* (١) هەریسە؛ شۆربایەکی خەستی
دانەوێڵەیەکە لە جۆ دەچێت. (٢) [Dial.]، (أ) شلەی گۆشت‌و سەوزەی تووند‌و
تیژ (ب) سەیرانێك کە ئەم جۆرە شلەیەی تێدا دەخورێت.

**Burgundy** (bũr′gən-di), *n.* (١) ناوچەی بەرگەندی لە ڕۆژهەڵاتی
فەرەنسا. (٢) شەرابێکی سوورە (لە سەرەتادا لەم ناوچەیە دروست دەکرا).

**burial** (ber′i-əl), *n.* ناشتن؛ مردوو ناشتن؛ بە خاك سپاردن.

*adj.* تایبەتی بە مردوو ناشتن؛ تایبەتی بە خاك سپاردن.

**burial ground,** گۆڕستان؛ قەبرسان

**burier** (ber′i-ẽr), *n.* مردووێنێژ؛ بە خاك سپێر

**burin** (byoo′rin), *n.* ئامێری نەخش هەڵکەندن لەسەر مەرمەڕو کانزا.

**burl** (bũrl), *n.* (١) گرێ (لە خوری، دەزوو، یا قوماشدا).
(٢) گرێی قەدی داروردەخت.
(٣) تەبەقە دارێکی تەنکی گرێ‌یاوی‌یە بۆ ڕازاندنەوە بەکاردەهێنرێت.

*v.t.* گرێ لێ لابردن (قوماش).

**burlap** (bũr′lap), *n.* گوش؛ جانفاس؛ قوماشی گونیەو خەرار.

**burlesque** (bẽr-lesk′), *n.* (١) شانۆگەری لاقرتێ‌و لاسایی.
(٢) خۆنواندنی بێ پەردەو ڕووت‌و قۆشمەی سەر شانۆ.

*adj.* تایبەتی بە شانۆگەری لاقرتێ‌و لاسایی‌و بێ پەردە.

*v.t. & v.i.* لاسایی کردنەوەو لاقرتێ‌و قەشمەری کردن لەسەر شانۆ.

**burley, Burley** (bũr′li), *n.* تووتنێکی ئەمەریکی گەڵا تەنکە.

**burly** (bũr′li), *adj.* تێکسمڕاو؛ چوارشانە؛ کەتە؛ زەبەلاح.

-burliness *(n.).*

**burn** (bũrn), *v.t.* (١) سووتاندن؛ ئاگرتێبەردان؛ گڕتێبەردان.
(٢) بە ئاگر کوشتن؛ سووتاندن (گیاندار). (٣) داپڵۆخاندن.
(٤) خۆرانکارکردن؛ خۆرگەستن. (٥) داخ کردن.
(٦) سوورکردنەوە (خشت، گۆزەودیزە).
(٧) بە ئاگر کردن (کون، سووتان): *( He ~ed a hole in his coat.)*
(٨) تووزاندنەوە؛ چووزاندنەوە؛ کزاندنەوە؛ سووتاندن (دەم، قوڕگ):
*( This hot pepper ~ed my mouth.)*
(٩) سووتاندن یا بەکارهێنان (مۆم، چرا، زۆپا).
(١٠) ئاگرتێبەردان (هەست، بەزەیی، تووڕەیی، حەز).
(١١) بەکارهێنان (سووتەمەنی)؛ سووتاندن:
*( This heater ~s gas. ; Her car ~s oil.)*
(١٢) [Slang]، کارەبا لێدان؛ بە کارەبا کوشتن.

*v.i.* (١) سووتان: *( The fire is ~ing.)* .
(٢) شەوقدانەوە؛ گەرمایی دان؛ ڕووناکی دانەوە.
(٣) داپڵۆخان؛ داپڵۆخین. (٤) بە ئاگر مردن؛ سووتان.
(٥) هەست کردن بە گەرما.
(٦) هاتنە جۆش‌وخرۆش؛ هەست زۆر گەرم بوون: *( to ~ with desire)* .
(٧) کزانەوە (برین، سووتاوی)؛ تووزانەوە.
(٨) [Slang]، کارەبا لێدان؛ بە کارەبا مردن یا کوژران.

*n.* (١) سووتاوی؛ سووتان؛ برینێك کە لە ئەنجامی سووتان یا گەرمادا بێت.
(٢) شوێنی داخ کراو؛ نیشانە (داخ کردن). (٣) خۆرانکاز.

burn down, سووتاندن (خانوو)؛ هەموو سووتاندن‌و تەخت کردن.

burn one's bridges, ڕێگەی گەڕانەوە لە خۆ بڕین.

burn oneself out, خۆ زۆر ماندووکردن (بە کار یا ڕابواردن)؛
هێز لە خۆ بڕین: *( He is burned out.)* .

burn out, (١) کوژانەوە. (٢) فەوتاندن بە ئاگر.
(٣) سووتاندن (ماڵ، دووکان... هتد). (٤) قانگ دان یا دەرپەڕاندن بە ئاگر.

burn up, [Slang], (١) زۆر تووڕەکردن؛ تووڕەبوون.
(٢) سەرزەنشت کردن بەتوندی.

**burn** (bũrn), *n.* [Scot.], جۆگەلە.

**burner** (bũr′nẽr), *n.* (١) چاو (پریمز، چێشت لێنەر، زۆپا).
(٢) کوورە؛ فڕن؛ زۆپا؛ چێشت لێنەر (ئامێر). (٣) سووتێنەر.

**burnet** (bũr′nit), *n.* جۆرە گوڵێکە.

**burning** (bũrn′iŋ), *adj.* (١) خەریکە دەسووتێت؛ لە سووتاندندایە.
(٢) زۆر گرنگ؛ گەرم (مەجان): *( a ~ issue)* .

**burning bush,** درەختێکە گوڵی بچووك‌و بەری سوور دەگرێت.

**burning glass,** شووشەی سووتێنەر: شووشەیەکی قۆقزە تیشکی
خۆری پێ کۆدەکرێتەوە بۆ سووتاندن یا گەرم کردن.

**burnish** (bũr′nish), *v.t. & v.i.* زاخاودانەوە؛ ساف‌ولووس کردن‌و
بریقاندنەوە (شمشێر، خەنجەر).

*n.* بریقە.

-burnisher *(n.).*

**burnoose, burnous** (bẽr-nōōs′, bũr′nōōs), *n.* بڕنووس:

عەبا یا پۆبی تەپلەدار

**burnsides** (bŭrn'sīdz´), *n.pl.* لاجانگی درێژی لە کلکی سمێڵ دراوو چەناگەی تاشراو.

**burnt** (bŭrnt), *alternative past tense and p.p. of* burn.

**bur oak,** (١) داربەڕوویەکی ئەمەریکییە کلاوبەڕووەکەی دڕکاوییە.
(٢) داری ئەم داربەڕووە (کە زۆر سەختە).

**burp** (bŭrp), *n.* [Slang], قرقینە.

*v.i.* [Slang], قرقینەدانەوە.

**burr, bur** (bŭr), *n.* (١) پەیکولە؛ دڕکێکی خڕە.
(٢) ڕووەکی پەیکولەدار (٣) کەسێکی خۆهەڵواسەر. (٤) قەراغی تیژ.
(٥) واشەر. ئەڵقەیەکی تەنکی لاستیکە بۆ ناوبڕکردنی بەلووعەو بۆری ناو.
(٦) ئامێری ددان کونکەری ددانساز.

*v.t.* قەراغ زبرکردن

**burr, bur** (bŭr), *n.* (١) ووتنی تیپی " ڕ " بە ددان لێ داگرتنەوە.
(٢) بێژەیەکی ددان لێ داگیراو (٣) قرەقر (دەنگی باڵی باڵندەو پەروانە).

*v.i. & v.t.* (١) ددان داگرتن لە ووتنی تیپی " ڕ " . (٢) قرەقرکردن.

**burr** (bŭr), *n.* = buhrstone.

**burro** (bŭr'ō, boor'ō), *n.* کەر؛ جاشوولکە؛ گوێ درێژ

**burrow** (bŭr'ō), *n.* (١) کونی ژێرزەوی (وەك هی گۆڕهەڵکەنە، مڵە، مشکەکوێرە، کەروێشك، ڕێوی... هتد). (٢) کونی خۆشاردنەوە؛ کون.

*v.i. & v.t.* (١) کونکردن؛ بنکەن کردن؛ هەڵکەندن؛ خواردنەوە.
(٢) خۆشاردنەوە (لە کون یا تونێلدا). (٣) پشکنین؛ بۆ گەڕان (بە هەڵکەندن).

**burrstone** (bŭr'stōn´), *n.* = buhrstone.

**burry** (bŭr'i), *adj.* (١) پەیکولاوی، پەیکولەدار (٢) تیژ؛ دڕکاوی

**bursa** (bŭr'sə), *n.* کیس یا بۆشایی کیس ئاسایی نێوان جومگەکانی لەش

**bursal** (bŭr's'l), *adj.* (١) تایبەتی بە کیسی نێوان جومگەکانی لەش.
(٢) دارایی؛ تایبەتی بە خەزێنە.

**bursar** (bŭr'sēr), *n.* (١) ژمێریار (لە زانکۆ یا دانشگادا).
(٢) قوتابی‌یەك کە یارمەتی دارایی وەردەگرێت لە زانکۆیەکی ئوسکوتلەندەدا.

**bursary** (bŭr'sə-ri), *n.* (١) خەزنەی زانکۆ یا پەرستگا
(٢) یارمەتی دارایی (لە زانکۆیەکی ئوسکوتلەندەوە).

-bursarial *(adj.)*.

**burse** (bŭrs), *n.* (١) جزدان؛ کیسەی پارە.
(٢) (ا) یارمەتی دارایی لە زانکۆوە.
(ب) ئەو خەزنەیەی ئەم یارمەتی‌یەی لێوە دەدرێت.

**bursiform** (bŭr'sə-fôrm´), *adj.* کیس ئاسا؛ لە کیس چوو.

**bursitis** (bēr-sī'tis), *n.* هەوکردنی کیسی نێوان جومگەکانی لەش.

**burst** (bŭrst), *v.i.* (١) تەقین؛ شەق بردن؛ کلپەکردن.
(٢) هەست تەقینەوە؛ دانە گریان یا پێکەنین:
*(She ~ into tears. ; She ~ into laughter.)*
(٣) لەپڕو بەتووڕەیی خۆکردن بە ژووردا یا سەر دەرخستن؛ دەرپەڕین:
*(He ~ into the room.)*
(٤) ئاوسەن؛ هەڵئاوسان؛ لە تەقینەوە نزیك بوون.

*v.t.* (١) تەقاندن؛ شەق پێ بردن. (٢) هەڵئاوساندن؛ ئاوساندن؛ فوتێکردن.

*n.* (١) تەقین؛ تەقینەوە؛ شەق بردن؛ شەقە؛ تەقە؛ کلپە. (٢) لێك ترازان؛ شکان.
(٣) جموجووڵێکی لەپڕ: *( a ~ of speed)* .
(٤) دەسرێژ؛ ڕیزە گوللە

**burthen** (bŭr'*th*ən), *n. & v.t.* [Archaic], = burden.

**burton** (bŭr't'n), *n.* پەتی خولخولۆکە (قورسایی بەرزکردنەوە).

**bury** (ber'i), *v.t.* (١) ناشتن (مردوو)؛ بە خاك سپاردن.
(٢) ناشتن؛ کردن بەژێر خاکەوە.
(٣) داپۆشین؛ شاردنەوە: *( He ~ied his face in his hands.)* .
(٤) ناشتن؛ لە بیری خۆ بردنەوە: *( Let's ~ our differences.)* .
(٥) نوقوم کردن؛ وون کردن: *( He ~ies himself in his work.)* .

**burying ground,** گۆڕستان؛ قەبرسان.

**bus** (bus), *n.* (١) پاس؛ پاسی ناوشار.
(٢) عەرەبانەی قاپ‌وقاچاغ گواستنەوەی چێشتخانە.
(٣) وایەر یا شیشی ئەستووری کارەباگەیێن.

*v.t.* خەڵك گواستنەوە بە پاس: *( to ~ students to school)* .

*v.i.* بەردەستی کردن لە چێشتخانەدا؛ قاپ‌وقاچاغی پیسی چێشتخانە گوێزانەوە: *( A bus boy ~es dirty dishes.)* .

**bus bar,** وایەر یا شیشی ئەستووری گەیەنەری کارەبا.

**bus boy,** بەردەستێکە کە قاپ‌وقاچاغی چێشتخانە دەگوێزێتەوە.

**busby** (buz'bi), *n.* کڵاوێکی فەرووی درێژی لوولەیی قووچە لە سوپای ئینگلیزیدا لەسەر دەکرێت.

**bush** (boosh), *n.* (١) دەوەن؛ بنچك. (٢) بێشە؛ بێشەلان؛ چڕستان.
(٣) کلکێکی ئەستووری تووکن. (٤) دەشت‌ودەری دەوەناوی.

*v.i.* (١) وەك بێشە لێهاتن؛ چڕبوون؛ بە پڕی ڕووان.
(٢) لە دەوەن چوون؛ وەك دەوەن وابوون.

*v.t.* بە دەوەن‌و بنچك ڕازاندنەوە، گرتن، یا پاڵپشتی کردن.

**beat around the bush,** مەبەست بەدەستەوە نەدان؛ خولانەوە بەدەوری باسێکداو مەبەست بەدەستەوە نەدان.

**bush** (boosh), *n.* دیوی ناوەوەی خەت خەتی لوولەیەکی ئاسن، پۆڵا یا پلاستیك.

*v.t.* خەت خەت کردنی دیوی ناوەوەی بۆری ئاسن، پۆڵا، یا پلاستیك.

**bushed** (boosht), *adj.* (١) حەپەساو؛ لە دارو دەوەندا وون بوو.
(٢) [Colloq.]، زۆر ماندوو.

**bushel** (boosh'əl), *n.* (١) بوشل: پێوانەیەکی دانەوێڵەو میوەیە دەکاتە هەشت گالۆن. (٢) دەفرێك کە بوشلێك بگرێت. (٣) بڕێکی زۆر؛ زۆر.

**bushel** (boosh'əl), *v.t. & v.i.* جل‌وبەرگ چاکردن (کورتکردنەوەو درێژکردن‌و پینەکردن).

-busheler; busheller *(n.)*.

**bushelman** (boosh'əl-mən), *n.* بەرگدروو؛ شاگرد بەرگدروو.

**bushing** (boosh'iŋ), *n.* دیوی خەت خەتاوی ناوەوەی بۆری ئاسن‌و پۆڵاو پلاستیك.

**bushman** (boosh'mən), *n.* کەسێکی دەشتەکی ئوستورالی؛ دارستان نشین؛ نیشتەنی شوێنی کەم ئاوەدانی.

**bushranger** (boosh'rān´jēr), *n.* (١) دارستان نشین.
(٢) چەتەی ناو دارستان (بەتایبەتی لە ئوستورالیا).

**bushwhacker** (boosh'hwak´ēr), *n.* (١) دەشت‌ودەرنشین.
(٢) شۆڕشگێڕ (بەتایبەتی یەکێك کە لە شەڕی براکوژی ئەمەریکادا لایەنگری بەشی خواروی ئەمەریکای دەکرد). (٣) تەوراس؛ داس.

**bushy** (boosh'i), *adj.* (١) دەوەناوی.
(٢) چڕ؛ پڕ (قژی سەر، برۆ، سنگ یا کلك): *( ~ eyebrows; a ~ tail)* .

**busily** (biz''l-i, biz'i-li), *adv.* بە سەرقاڵی؛ هەمیشە خەریك.

**business** (biz'nis), *n.* (١) پیشە؛ کار.
(٢) دەربەست؛ پێویستی سەرشان: *( None of your ~ !)* .
(٣) کاروبار؛ ئیش‌وکار. (٤) بازرگانی؛ ئاڵوێر.
(٥) کاروکاسبی.
(٦) دەزگایەکی بازرگانی؛ شوێنی کاروکاسبی.
(٧) شێوەی بەڕێوەبردنی دەزگای بازرگانی.
(٨) کردار (بەتایبەتی لە شانۆگەریدا لەکاتی بێ گفتوگۆدا).

**business is business,** برادەرێتی‌و پارەو کاروکاسبی دەبێت لەیەك جیابکرێنەوە؛ برادەرێتی‌و بازرگانی جیان.

**go into business,** کاروکاسبی سەربەخۆ کردن.

**have no business (to do something),** ماف نەبوونی کردنی شتێك.

**mean business,** بە ڕاست بوون؛ سووربوون لەسەر؛ بە گاڵتە نەبوون.

**put out of business,** مایەپووچ کردن؛ تابووت کردن.

**business college (or school),** قوتابخانەی بازرگانی (بۆ

فێرکردنی چاپکردن و دەفتەرگرتن و هەڵسووڕاندنی ئیش‌وکاڕ.

**businesslike** (biz′nis-līk′), *adj.* کارگوزارانە؛ کارگوزار:
***( to have a ~ attitude)***

**businessman** (biz′nis-man′), ***n.*** بازرگان؛ خاوەن ئیش؛ کاسبکار؛ خاوەن دەزگای کاروکاسبی.

**businesswoman** (biz′nis-woom′ən), ***n.*** ژنە بازرگان؛ خاوەن ئیش (ژن).

**busk** (busk), ***n.*** (١) تیلماسکە باغە، دار، یا ئیسقانێکە بەرگی ئافرەتی پێ قنج دەکرێتەوە (٢) کەمەربەند.

**buskin** (bus′kin), ***n.*** (١) لاپچینی کورت؛ جزمەی کورت.
(٢) لاپچینی کورتی ئەکتەری شانۆگەرییە کارەساتاوییەکانی یۆنان و ڕۆمان.
(٣) شانۆگەری کارەساتاوی.

**busman** (bus′mən), ***n.*** شۆفێری پاس

**bus stop,** وێستگەی پاس

**buss** (bus), ***n.*** [Arch. or Dial.], ماچ‌وموچ؛ ماچ.
***v.i. & v.t.*** ماچ‌وموچ کردن.

**bust** (bust), ***n.*** (١) نیوەپەیکەر (لە ناوقەد بەرەوژوور)؛ پەیکەری سنگ و سەر. (٢) سنگ و مەمک؛ سینەی ئافرەت.

**bust** (bust), ***v.t. & v.i.*** [Slang], (١) شکاندن؛ شکان (مەکینە، ئامێر)
(٢) مایەپووچ کردن؛ ئابووت کردن. (٣) پلەوپایە نزم کردنەوە؛ پلە شکان.
(٤) مالی کردن (ئەسپی کێوی ڕۆژئاوای ئەمەریکا).
(٥) مستەکۆڵەلێدان؛ پیاکێشان.
(٦) هەلوەشاندنەوە؛ شکاندن؛ ڕووخاندن: ***( to ~ a trade union)*** .
(٧) گرتن (بەندیخانە): ***( He was ~ed. ; The police ~ed him.)*** .
***n.*** [Slang], (١) ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن. (٢) مستەکۆڵە؛ پیاکێشان؛ لێدان.
(٣) زەماوەند (٤) مایەپووچی؛ ئابووتی.
(٥) بێ دزاری؛ کەم بازاڕی. (٦) گرتن (بەندیخانە).

**bustard** (bus′tērd), ***n.*** باڵندەیەکی کێوییە لە مریشك دەچێت.

**buster** (bus′tēr), ***n.*** [Slang], (١) شتێکی زل و سەرنج ڕاکێشەر.
(٢) مالییکەر: ***( a horse ~ )*** . (٣) زەماوەند.
(٤) شکێن؛ شکێنەر: ***( a union ~ )*** .
(٥) [B-]، کوڕ؛ پیاو؛ کورە (بۆ بانگ کردن).

**bustle** (bus′′l), ***v.i. & v.t.*** هاتن و چوون بە شپرزەیی؛ هەڵپەکردن؛ بە پەلە و دەنگەدەنگ شت کردن: ***( to ~ about)*** .
***n.*** خرۆشان؛ جموجووڵی بە پەلە و شپرزە؛ بەزم‌وڕەزم.

**bustle** (bus′′l), ***n.*** ناوناخن یا چوارچێوەی دواوەی تەنوورەی ژنان (بۆ ئەوەی فش دەرکەوێت)؛ فش‌وفۆڵی دواوەی تەنوورە.

**busy** (biz′i), ***adj.*** (١) سەرقاڵ؛ هەمیشە خەریك.
(٢) پڕ (بەرنامە): ***( a ~ schedule)*** .
(٣) گیراو (تەلەفۆن)؛ لەکاردایە: ***( The telephone line is ~ .)*** .
(٤) خۆتێهەڵقورتێنەر.
(٥) پڕ (نەخشە)؛ پڕو ئاڵۆز: ***( a ~ design)*** .
***v.t.*** خەریك کردن؛ خۆ خەریك کردن.
**-busyness *(n.).***

**busybody** (biz′i-bod′i), ***n.*** دەستخەرە ناو کاروباری خەڵکەوە؛ خۆتێهەڵقورتێنەر.

**but** (but; *unstressed*, bət), ***prep.*** (١) بێجگە لە؛ جگە لە؛ تەنها:
***( Nobody came ~ me.)***
(٢) لەوە بەولاوە؛ لەوە زیاتر: ***( We cannot choose ~ stay.)*** .
***conj.*** (١) تەنها؛ جگە لە: ***[ Nobody came ~ I (came) ]*** .
(٢) بەڵام؛ لەگەڵ ئەوەشدا:
***( He is a villain, ~ he has some virtues.)***
(٣) بەڵام: ***( I am old, ~ you are young.)*** .
(٤) تەنها؛ بەڵام: ***( It never rains ~ it pours.)*** .
(٥) کە: ***( I don't question ~ you're correct.)*** .
(٦) ئەگەر وانەبێت یا ڕوونەدات، واتە هەمیشە وایە:
***( I never go past that house ~ I think of her.)***
(٧) لەوە زیاتر؛ لەوە بەولاوە؛ جگە لەوە: ***( I cannot ~ try.)***
(٨) لەوە؛ جگە لەوە: ***[ There was nothing else to do ~ (to) go. ]***
***adv.*** (١) تەنها؛ ئەگەر تەنها: ***( If I had ~ known.)*** .
(٢) تەنها: ***( He is ~ a child.)*** .
(٣) هەر؛ تەنها: ***( I heared it ~ now.)*** .
(٤) [Dial.]، لەدەرەوە؛ دەرێ.

**all but,** خەریکە؛ نزیکە لە؛ زۆری نەماوە:
***( It's all but finished.)***

**but for,** ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە؛ بەبێ:
***( But for your help, I would have failed.)***

**butadiene** (bū′tə-dī′ēn, bū′tə-dī-ēn′), ***n.*** بیوتادین: هایدرۆ- کاربۆنێکی خۆش سووتە لە پەترۆڵ دەردەهێنرێت و لە درووستکردنی لاستیکی دەستکردا بەکاردەهێنرێت.

**butane** (bū′tān, bū-tān′), ***n.*** بیوتان: گازێکە بۆ سووتەمەنی و درووستکردنی لاستیکی دەستکرد بەکاردەهێنرێت.

**butch** (booch), ***n.*** [Slang], ئافرەتێکی مێبازی نێرئاسا یا کەڵە.

**butcher** (booch′ēr), ***n.*** (١) (ا) سەربڕ؛ قەساب. (ب) گۆشتفرۆش.
(٢) پیاوکوژ؛ خوێنڕێژ.
(٣) فرۆشیار (شیرینی و گۆڤار لەناو شەمەندەفەرو سینەمادا).
***v.t.*** (١) قەسابی کردن؛ گیاندار سەربڕین و فرۆشتنی گۆشتەکەیان.
(٢) خوێن ڕشتن؛ کوشتن بە دڕندانە (مرۆڤ، گیاندار)؛ سەربڕین؛ قەلاچۆکردن
(٣) تێکدان؛ شێواندن بەسەریەکدا؛ بە نەزانانە کردن.

**butcherbird** (booch′ēr-būrd′), ***n.*** باڵندەیەکی نێچیروانە کە پاش کوشتنی نێچیرەکەی هەڵی دەواسێت بەسەر دڕك‌ودالەوە.

**butcher knife,** کێرد؛ چەقۆی تیژی گەورە.

**butcherly** (booch′ēr-li), ***adv.*** (١) قەسابانە
(٢) دڕندانە؛ خوێنڕێژانە.

**butcher's-broom** (booch′ērz-brōōm′), ***n.*** ڕووەکێکە لقەکانی لە گەڵای بریقەدار دەچێت گوڵی سپی هێشوویی و بەری وەك شیلان دەگرێت.

**butcher shop,** فرۆشتگای گۆشت.

**butchery** (booch′ēr-i), ***n.*** (١) کوشتارخانە؛ قەسابخانە.
(٢) قەسابی؛ سەربڕینی گیاندارو فرۆشتنی گۆشتەکەی.
(٣) فرۆشگای گۆشت (٤) خوێن ڕشتن؛ کوشتار؛ کوشتنی دڕندانە.

**butler** (but′lēr), ***n.*** گەورەی بەردەستان (لە ماڵێکی گەورەدا)؛ بەردەست (بەتایبەتی کە لێپرسراوی خوانی گەورەماڵێکە).

**butler's pantry,** گەنجینەیەکی بچووکە لەنێوان چێشتخانەو ژووری نانخواردندا.

**butlery** (but′lēr-i), ***n.*** = **butler's pantry.**

**butt** (but), ***n.*** (١) قنگ یا سەرە ئەستوورەکەی شتێك:
***( the ~ of a rifle)***
(٢) بنەدار؛ کۆتەرەدار (کە لە زەویدا دەمێنێتەوە).
(٣) قنگە جگەرە؛ قنچکە جگەرە.
(٤) گردۆڵکەی پشت نیشانێك (کە تەپاغە بەتاڵەکانی تێدا گیردەبێتەوە).
(٥) نیشان. (٦) ***(pl.)***، مەودای نیشان.
(٧) تەشەرەی خەڵك (مرۆڤ، شت)؛ گاڵتەچی خەڵك: ***( the ~ of jokes)*** .
(٨) [Slang]، جگەرە.
(٩) [Slang]، گووپی قنگ؛ سمت؛ قنگ.
(١٠) پاش و لاتەنیشتی پێستەی خۆشکراو.
***v.t. & v.i.*** هەردووسەری شتێك لێکدان.

**butt** (but), ***v.t.*** (١) شۆق لێدان؛ قۆچ لێدان؛ قۆچ هاویشتن؛ سەرپیاکێشان.
(٢) پیادان؛ پیاکێشان؛ خۆپیادان.
(٣) بەرکەوتن؛ هاوستووربوون؛ لەسەر بەندبوون؛ بەر سەرەکەی کەوتن.
***v.i.*** (١) شۆقدان؛ قۆچ هاویشتن؛ سەرپیاکێشان. (٢) بەسەردا ڕۆیشتن.

(٣) دەرپۆقین؛ دەرپەڕین. (٤) بەرکەوتن؛ لێدان؛ بەر سەرەکەی کەوتن.
*n.* (١) شوق؛ قوچ. (٢) پیاکردن یا پیادان (یاری شیربازی).
**butt in,** [Slang], خۆتێهەڵقورتان؛ تێهەڵکوتان
**butt into,** [Slang], خۆتێهەڵقورتان؛ تێهەڵکوتان.
**butt** (but), *n.* (١) بەرمیلی شەراب و بیرە.
(٢) پێوانەیەکی شلەیە بریتییە لە سەدوبیستوشەش گالۆن.
**butt** (but), *n.* جۆرە ماسییەکی پانکۆڵەیە.
**butte** (būt), *n.* تاقە گردێکی دەشتایییەکە.
**butter** (but'ēr), *n.* (١) کەرە. (٢) جۆرە مرەبایەکی وەك کەرەیە.
(٣) [Colloq.]. مەرایی؛ پشی پشی کردن.
*v.t.* (١) کەرە لێدان.
(٢) [Colloq.]. (~ up)، مەرایی بۆ کردن؛ کلکەلەقێ بۆ کردن.
**know which side one's bread is buttered on,** سوودی خۆ- زانین؛ جاکەی خۆ زانین.
**look as if butter would not melt in one's mouth,** شەرمن و ساویلکە دیاربوون؛ خۆ بە شەرمن و ساویلکە نواندن.
**butterball** (but'ēr-bôl'), *n.* (١) bufflehead .
(٢) [Colloq.]. کەسێکی قەڵەو.
**butter bean,** (١) رووەکی فاسۆلیایەکی دەنك پان و زلی ئەمەریکایییە.
(٢) ئەم جۆرە فاسۆلیایە
**buttercup** (but'ēr-kup'), *n.* (١) گوڵەبەهارە
(٢) رووەکی ئەم گوڵە.
**butterfat** (but'ēr-fat'), *n.* چەورایی شیر.
**butterfingers** (but'ēr-fiŋ'gērz), *n.* [Colloq.]. کەسێکە کە هەمیشە شت لە دەستی دەکەوێتە خوارەوە؛ کەسێکی دەست وپل پەڕۆ.
**butterfish** (but'ēr-fish'), *n.* ماسییەکی گۆشت ناسکە وەك کەرە.
**butterfly** (but'ēr-flī'), *n.* (١) پەپوولە
(٢) ئافرەتێکی بەرگ رەنگینی حولحول بێ وەفا.
**butterfly fish,** پەپوولە ماسی: جۆرە ماسییەکی رەنگاورەنگە.
**butterfly valve,** دەمەوانەی دووپەرەیی (وەك باڵی پەپوولە)
**butterfly weed,** گیایەکی شیلە سپی پزیشکییە (بۆ ئارەق کردنەوە)
**butterine** (but'ə-rēn', but'ə-rin), *n.* کەرەی دەستکرد
**butter knife,** چەقۆی کەرە: چەقۆیەکی کول بچووکە کەرەی لە نان پێ هەڵدەسووێت.
**buttermilk** (but'ēr-milk'), *n.* ماستاو؛ دۆی خەست.
**butternut** (but'ēr-nut'), *n.* (١) گوێزێکی ئەمەریکی چەورە.
(٢) دارگوێزی ئەم گوێزە. (٣) (*pl.*). ئاوداماتی قاوەیی.
(٤) سەربازێکی جیابوونەوەخوازی باشووری ئەمەریکا لە شەڕی براکوژیدا.
**butterscotch** (but'ēr-skoch'), *n.* شیرینییەکە لە شەکری بۆر و کەرە دروست دەکرێت
**butterwort** (but'ēr-wûrt'), *n.* مێرووگرە: رووەکێکی گەڵا لینجە جانەوەر دەگرێت
**buttery** (but'ri, but'ēr-i), *n.* (١) گەنجینەی عەرەق و شەراب.
(٢) گەنجینە. (٣) فرۆشگای زانکۆ (بەتایبەتی لە ئینگلتەرە).
**buttery** (but'ēr-i), *adj.* (١) کەرەیی؛ لە کەرە چوو؛ چەور؛ نەرم.
(٢) کەرە لێدراو؛ کەرە تێهەڵسوواو؛ مەراییکەر.
**butting** (but'iŋ), *n.* سنوور.
**butt joint,** جمسەر (ئەندازیاری)
**buttock** (but'ək), *n.* (١) سمتێك؛ گووپی سمتێك؛ گووپێکی قنگ.
(٢) (*pl.*). سمت؛ گووپی سمت؛ کەفەل؛ گووپی قنگ.
(٣) (*pl.*). پاشەڵ؛ دواوەی سەرئاوکەوتووی کەشتی.
**button** (but'n), *n.* (١) قۆپچە؛ دوگمە؛ کوورژەکە
(٢) شتێکی قۆپچە ئاسایی.
(٣) درووشم یا نیشانێکە دەکرێت یا بەخەوە؛ بەخەبەند.
(٤) دەسك؛ دوگمەی دەسك. (٥) دوگمەی زیلی دەرگا یا گلۆپ داگیرسان.
(٦) قارچکێکی فەریکی بچووکە. (٧) [Slang]، چەناگە.
*v.t. & v.i.* قۆپچە داخستن: *(to ~ one's shirt, coat, etc.)* .
**buttonball** (but''n-bôl'), *n.* = buttonwood.
**buttonbush** (but''n-boosh'), *n.* بنچکێکی گوڵ قۆپچەیییە.
**buttonhole** (but''n-hōl'), *n.* (١) کونە قۆپچە؛ ئەو کونەی دوگمەی پێ دادەخرێت. (٢) گوڵی یەخە.
*v.t.* (١) کونە قۆپچە کردنە جل و بەرگەوە.
(٢) بەرۆك گرتن؛ یەخەگرتن؛ وەستاندن و قسە لەگەڵ کردن:
*(to ~ someone in the street)*
**buttonmold** (but''n-mōld'), *n.* پارچەیەك دار یا کانزایە بە قوماش یا چەرم دەوری دەگیرێت و دەکرێت بە قۆپچە.
**buttons** (but''nz), *n.pl.* [Colloq.], بەردەستی میوانخانە.
**buttonwood** (but''n-wood'), *n.* (١) درەختێکە لە سوورەچنار دەچێت. (٢) داری ئەم درەختە.
**buttony** (but''n-i), *adj.* (١) لە قۆپچە دەچێت؛ قۆپچە ئاسا.
(٢) بە قۆپچە رازێنراوەتەوە؛ قۆپچەی زۆر پێوەیە.
**buttress** (but'ris), *n.* (١) پشتیوانی دیوار (کە لە بەرد یا خشت دروست دەکرێت)؛ پاڵپشتی دیوار. (٢) پاڵپشت؛ کۆڵەکە؛ پایە.
*v.t.* (١) پاڵپشتی کردن (بە کۆڵەکە یا پایە)؛ پشتیوان گرتن.
(٢) پاڵپشتی کردن؛ بەهێزکردن؛ پشتیوان کردن؛ راگیرکردن.
**butyl** (bū'til), *n.* بیوتیل (کیمیا).
**butylene** (bū't'l-ēn'), *n.* بیوتیلین (کیمیا).
**butyraceous** (bū'tēr-ā'shəs), *adj.* کەرەیی؛ وەك کەرە وایە.
**butyric** (bū-tir'ik), *adj.* (١) کەرەیی؛ لە کەرە پەیدابوو.
(٢) تایبەتی بە ترشی کەرە.
**butyric acid,** ترشی کەرە: شلەیەکی بێ رەنگی بۆگەنە لە کەرەی ترشاو پەیدادەبێت.
**buxom** (buk'səm), *adj.* (١) لەش پڕ و تەندرووست و بەدڵداچوو؛ خڕین؛ خڕوم: *(a ~ woman)* . (٢) [Archaic]، نەرم.
(٣) [Archaic]، گوێ رایەڵ؛ ملکەچ.
**buy** (bī), *v.t.* (١) کڕین. (٢) بە بەرتیل کڕین؛ بەرتیل پێدان.
(٣) [Slang]، بڕوا پێ بوون.
*v.i.* کڕین.
*n.* (١) کڕین؛ کڕینێك. (٢) شتی کڕراو؛ شتێك کە بتوانرێت بکڕرێت.
(٣) [Colloq.]، شتێکی بە هەرزان کڕراو؛ شتێك کە لەو نرخەی پێی کڕراوە زیاتر بهێنێت؛ کڕراوێکی باش: *(That house is a good ~.)*
-buyable *(adj.).*
**bad buy,** [Colloq.], ئەو نرخە ناهێنێت کە پێی دراوە یا کە لێی داوا دەکرێت.
**buy back,** کڕینەوەی شتێك لەلایەن فرۆشیارەکەیەوە.
**buy into,** [Slang], بەش کڕین لە بەشکەیەکدا بۆ بوون بە ئەندام.
**buy off,** بە بەرتیل کڕین؛ بەرتیل پێدان.
**buy out,** لێ کڕینەوە؛ کڕینەوەی بەشی کەسێك (هاوبەشی).
**buy up,** هەموو کڕین؛ کڕینی هەمووی.
**good buy,** [Colloq.], کڕاوێکی باش یا بەسوود.
**buyer** (bī'ēr), *n.* (١) کڕیار؛ بکڕ.
(٢) کڕیاری شتوومەك بۆ دەزگایەکی بازرگانی.
**buzz** (buz), *v.i.* (١) وویزەوویزهاتن؛ وویزەهاتن؛ ووزەووزکردن.
(٢) بەجۆشەوە و بەبێ وەستان و وورتەوورت کردن.
(٣) لە پاش ملە باسکردن. (٤) بە شپرزەیی جووڵانەوە.
*v.t.* (١) لە پاش ملە باسکردن؛ قاوخستنەوە بە دەنگی نزم و بەبێ وەستان.
(٢) وویزەوویزکردن؛ ووزەووزکردن: *(hornets ~ing their wings)*
(٣) زۆر بە نزمی بەسەردا فڕین:
*(The plane ~ed the ship.)*
(٤) زەنگ بۆ لێدان؛ ووریاکردنەوە بە زەنگ.

(٥) [Colloq.]، تەلەفۆن بۆ کردن.

*n.* (١) وویزە (هەنگ، زەردەواڵە)؛ وویزەوویز؛ ووزەووز. (٢) وورتەوورت.

(٣) [Colloq.]، تەلەفۆن کردن: *( Give me a ~ tonight.)* .

(٤) [Colloq.]، سەرخۆشی.

**buzz about (or around),** بە فڕكوهوور ڕۆیشتن؛ فڕکەفڕك هاتن؛ ڕاکەڕاك کردن

**buzz off!, [Slang],** لاچۆ!؛ لاچۆ لێرە!؛ لاچۆ لەبەرچاوم!.

**give (a person) a buzz, [Slang],** تەلەفۆن بۆ کردن.

**buzzard** (buz′ẽrd), *n.* (١) سیسارك؛ سیسارکە کەچەڵە.

(٢) [British]، هەڵۆ (٣) کەسێکی چاوبرسی ناپەسەند.

**buzz bomb,** بۆمبای وویزەکەر: بۆمبایەکی خۆهاوێژەرە وویزەی لێوەدێت لەکاتی فڕیندا

**buzzer** (buz′ẽr), *n.* زەنگی کارەبا (وەك هی دەرگا).

**buzz saw,** مشاری وویزەدار: مشارێکی خڕی کارەبایی وویزەدارە.

**buzzwig** (buz′wig′), *n.* (١) بارۆکەیەکی بژنی زل.

(٢) بارۆکە لەسەر (٣) کەسێکی پلەوپایە بەرز.

**by** (bī), *prep.* (١) لەنزیك؛ بەتەنیشت؛ لەلای؛ لای؛ نزیك:
*( I am standing ~ the door.)*

(٢) (ا) بە (کات): *( He travels ~ night. ; She works ~ the hour.)* .

(ب) لە کاتێکی تایبەتی درەنگتر نا: *( Be back ~ ten o'clock.)* .

(٣) بە؛ لەرێوە (گەشت): *( He went ~ way of New York.)* .

(٤) بەلادا؛ بەتەنیشتدا: *( He walked right ~ me.)* .

(٥) بۆ (بۆ باش بوون یا خراپ بوون): *( He did well ~ his children.)* .

(٦) بە (دروستکردن): *( This rug is made ~ hand.)* .

(٧) لەلایەن؛ بە دەستی: *( This poem is written ~ her.)* .

(٨) بەپێی؛ بەگوێرەی: *( He fights ~ the book.)* .

(٩) بە (پلەپلە، ووردەووردە): *( It grows dark ~ degrees.)* .

(١٠) بە (سوێند خواردن: بە خودا): *( Yes, ~ God!)* .

(١١) بە (کێشان، گۆڕینەوە، پێوان): *( We sell apples ~ the pound.)* .

(١٢) بە (پێوان: دارێکی دووگرێ بە چوارگرێ): *( a two ~ four)* .

(١٣) بە *( He went ~ car.)* .

(١٤) بەسەر: *( You can divide ten ~ two.)* .

*adv.* (١) لەنزیکەوە؛ نزیك: *( Stand ~ !)* .

(٢) ئەولاوە (پاشەکەوت کردن)؛ لاوە: *( We have put money ~ .)* .

(٣) بەلادا؛ بەتەنیشتدا: *( The car sped ~ .)* .

*adj. & n.* ناسەرەکی

**by and by,** پاش ماوەیەك؛ پاش کاتێکی کەم؛ زۆری پێ ناچێت.

**by and large,** بەگشتی

**by far,** زۆر (بەراووردکردن)؛ ئێجگار:
*( This one is better by far.)*

**by the by,** = **by the way.**

**by the way,** بەم بۆنەیەوە؛ ئۆ! (لەکاتی قسەکردندا کە باسێکی تر دەهێنێتە پێشەوە، وەك بڵێیت: ئۆ! بەخوا باش بوو بیرم کەوتەوە!).

**by-** (bī), پێشگرێکە بەمانای: (١) نزیك؛ لەنزیکەوە؛ بەتەنیشت:
*(bystander)*

(٢) ناسەرەکی: *(byproduct)* .

**by-and-by** (bī′′n-bī), *n.* (١) دوارۆژ (٢) ئەوەو دنیا؛ قیامەت.

**by-bidder** (bī′bid′ẽr), *n.* کەسێکە کە لە هەراجدا نرخی شتی هەراج کراو بەرزدەکاتەوە بە ڕێکەوتنی پێشەکی لەگەڵ خاوەن شتەکەدا.

**by-blow, bye-blow** (bī′blō′), *n.* (١) لێدانێکی ڕێکەوت.

(٢) مندالێکی زۆڵ؛ زۆڵ.

**bye** (bī), *adj.* ناسەرەکی؛ ڕێکەوت.

**by the bye,** = **by the way.**

**bye-bye** (bī′bī′), *n. & interj.* خواحافیز؛ خوات لەگەڵ

**by-election** (bī′i-lek′shən), *n.* هەڵبژاردنێکی تایبەتی ناسەرەکی (بۆ پڕکردنەوەی جێگەی نوێنەرێکی مردوو یا لێخراو).

**bygone** (bī′gôn′, bī′gon′), *adj.* بەسەرچوو؛ ڕابوردوو.

*n.* شتێکی ڕابوردوو یا بەسەرچوو.

**let bygones be bygones,** ئەوەی چوو چوو؛ ئەوەی بەسەرچوو بەسەرچوو.

**bylaw** (bī′lô′), *n.* پەیڕەوی ناوخۆی ڕێکخراو، کۆمەڵە، یا کۆمپانیایەك؛ پەیڕەوی ڕێکخراو یا کۆمپانیایەك نەك میری.

**by-line** (bī′līn′), *n.* دێڕێکە لەسەروو ووتارێکەوە نووسەرەکەی ناونووس دەکات.

**byname** (bī′nām′), *n.* (١) لەقەب. (٢) نازناو.

**bypass** (bī′pas′, bī′päs′), *n.* (١) لاڕێ (بەتایبەتی کە بەلای شارێك یا شوێنێکدا تێپەڕدەبێت). (٢) ڕێ، ئاوەڕۆ، یا گوزەرگای لقی یا ناسەرەکی (بە بۆری). (٣) کارەباڕۆی تەنیشتی یا لقی.

*v.t.* (١) بەلادا تێپەڕین؛ خۆ لێ لادان (کەندوکۆسپ)؛ بەدەوردا ڕۆیشتن.

(٢) گوێ پێ نەدان؛ پەڕاندن: *( to ~ routine procedures)* .

(٣) پیابردن (ئاو یا شلە بە بۆرییەکی لقیدا).

**bypast** (bī′past′, bī′päst′), *adj.* ڕابوردوو؛ بەسەرچوو.

**bypath** (bī′path′, bī′päth′), *n.* توولەڕێ؛ لاڕێ؛ کوێرەڕێ.

**byplay** (bī′plā′), *n.* گفتوگۆ یا کرداری لەلاوەی سەرشانۆ (لەکاتێکدا کە شانۆگەرییەکە بەردەوام دەبێت).

**byproduct** (bī′prod′əkt), *n.* (١) بەرهەمی لەلاوە یا ڕێکەوت (پیشەسازی). (٢) ئەنجامی ڕێکەوت، لەلاوە، یا ناسەرەکی.

**byre** (bīr), *n.* گەووڕی مانگا؛ تەویلەی ڕەشەووڵاخ.

**byroad** (bī′rōd′), *n.* لاڕێ؛ بارێکەڕێ؛ چەپەڕێ.

**Byronic** (bī-ron′ik), *adj.* (١) بایرۆنی: تایبەتی بە هۆنەری ڕۆمانتیکی ئینگلیز " بایرۆن " و هەڵبەستەکانی.

(٢) ڕۆمانتیکیو سەربەرزو لاقرتێکەر.

**byssus** (bis′əs), *n.* (١) قوماشێکی کەتان یا ئاوریشمی کۆنە میسرییە فیرعەونییەکان دەیان پێچا لە مردووی مۆمیاکراوەوە.

(٢) ڕیشۆڵەی زۆر بارێکە کە گیانداری قاوغداری ئاوی خۆی پێوە دەنووسێنێت بە بەردو شتی ترەوە.

**bystander** (bī′stan′dẽr), *n.* سەیرکەری ڕێکەوت (ڕووداو)؛ تەماشاکەری ڕێکەوتی ڕووداوێك (بەبێ بەشداربوون تیایدا).

**bystreet** (bī′strēt′), *n.* شەقامێکی بچووك؛ کوێرە شەقام؛ لاڕێ.

**by-talk** (bī′tôk′), *n.* قسەی کات کوشتن؛ قسەی بێ بایەخ.

**byway** (bī′wā′), *n.* (١) bypath .

(٢) لقێکی زانست یا لێکۆڵینەوەی ناسەرەکی یا گوێ پێ نەدراو.

**byword** (bī′wũrd′), *n.* (١) پەندی پێشینان.

(٢) نموونەی چین، ڕەگەز، یا هەڵوێستێك (مرۆڤ، شت).

(٣) قەشمەر؛ کەسێکی ناوزڕاو یا بە سووك تەماشاکراو.

(٤) نازناو؛ ناتۆرە

**bywork** (bī′wũrk′), *n.* کاری لەلاوە کراو (لەکاتی بێکاری یا پشوودا).

**Byzantine** (bi-zan′tin, biz′′n-tēn′, biz′′n-tīn′), *n.* بیزەنتی: هاووڵاتییەکی شاری " بیزەنتە " ی کۆن.

*adj.* (١) تایبەتی بە شانشینی " بیزەنتە " ی کۆنو کلتوورەکەی؛ تایبەتی بە شانشینی ڕۆمانی ڕۆژهەڵات. (٢) (ا) ئاڵۆز. (ب) پیلاناوی؛ فڕوفێڵاویو ئاڵۆز (ڕامیاری). (٣) هونەری خانووسازی بیزەنتی (کە بریتییە لە گومەزو تاقی کەوانەییو نەقشو کاشیکاری).

**Byzantium** (bi-zan′shi-əm, bi-zan′ti-əm), *n.* بیزەنتە: پایتەختی شانشینی ڕۆمانی کە ئێستا پێی دەوترێت: " ئەستەمبوول " .



**C, c** (sē), *n.* (١) تیپی سێیەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە
(٢) دەنگی ئەم تیپە کە " ک " ە لەپێش تیپە بزوێنی " a, o, u " وە هەموو تیپە نەبزوێنەکان جگە لە " h " . بەڵام دەنگی " س " ە لەپێش تیپە بزوێنی " e, i, y " . وە ووشەی بە " cc- " کۆتایی هاتوو.
" ch " دەبێ بە " چ " لە ووشەی " church " دا. وە " ci " بە " ش " لە ووشەی " vicious " دا. (٣) ئەم تیپە بە چاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) نیشانەی پلەی سێیەم؛ سێیەم.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی " C " . (٢) سێیەم؛ سێیەمین.
**C** (sē), *n.* (١) شتێکە کە شێوەی لە تیپی " C " بکات.
(٢) ژمارە ١٠٠ ی ڕۆمانی. (٣) هێمای کاربۆن (کیمیا).
(٤) نمرەی مام ناوەندی (قوتابخانە):
*( She received a "C" in biology.)*
(٥) ژمارەی نەگۆڕ (بیرکاری).
(٦) نۆتەی مۆسیقا.
*adj.* شێوەی لە تیپی " C " دەچێت.
**Caaba** (kä′bə, kä′ə-bə), *n.* کەعبە
**cab** (kab), *n.* (١) (ا) تەکسی؛ ئوتومبیلی کرێ (ب) گالیسکەی کرێ.
(٢) کورسی شۆفێر (لۆری، شەمەندەفەر، تراکتۆر).
**cab, kab** (kab), *n.* پێوانەیەکی کۆنی جوولەکەیە بریتییە لە نیو گالۆن.
**cabal** (kə-bal′), *n.* (١) ڕێکخراوێکی نهێنی
(٢) پیلانی ڕێکخراوێکی وەها؛ پیلان
*v.i.* بوون بە ئەندامی ڕێکخراوێکی نهێنی؛ پیلان گێڕان
**cabala** (kab′ə-lə, kə-bä′lə), *n.* (١) فەلسەفەیەکی ئاینی نهێنی سۆفییانەی کۆنی هەندێ مالوومی جوولەکەیە (٢) بیروڕای نهێنی.
**-cabalic** *(adj.)*; **cabalism** *(n.)*; **cabalist** *(n.)*.
**caballero** (kab′əl-yâr′ō), *n.* (١) خانەدان یا سوارچاکی ئیسپانی.
(٢) ئەسپ سوار؛ سوارچاك.
**cabana** (kə-bä′nə, kə-ban′ə), *n.* (١) کوختە یا کەپری کەنار دەریا
(٢) سەرشۆرك و ئاودەستخانەی کەنار دەریا
**cabaret** (kab′ə-rā′), *n.* (١) مەیخانە یا چێشتخانەیەکە بە شانۆی سەماو مۆسیقاوە (٢) ئەم بەرنامەی سەماو مۆسیقایە.
**cabbage** (kab′ij), *n.* (١) کەلەرم
(٢) گۆپکەی جۆرە دارخورمایەکی ئەمەریکاییە.
*v.i.* وەك سەلکە کەلەرم لێهاتن.
**cabbage** (kab′ij), *v.t. & v.i.* دزین؛ دزینەوە.
*n.* قوماشی دزراو لەلایەن بەرگدرووەوە.
**cabbage palm,** جۆرە دارخورمایەکە گۆپکەکانی دەخورێت.
**cabbage palmetto,** = **cabbage palm.**
**cabby** (kab′i), *n.* [Colloq.], = **cabman.**
**cabdriver** (kab-drī′vẽr), *n.* شۆفێری تەکسی.
**caber** (kā′bẽr), *n.* داری هاوێژراو (بۆ تاقیکردنەوەی بەهێزی لە ملەملێدا).
**cabezon** (kab′ə-zon′), *n.* ماسییەکی گەورەی دەریای پاسیفیکە.
**cabin** (kab′in), *n.* (١) خانووچکە (بەتایبەتی هی دارو تەختە)؛ کوختە.
(٢) ژووری بچووکی کەشتییەوان. (٣) ژووری بچووکی ڕێبواران لە کەشتیدا.
(٤) ژووری ڕێبوارانی ناو فڕۆکە.
**cabin boy,** بەردەستی کەشتی.
**cabin class,** پلەی دووەمی کەشتی گەشت.
**cabin cruiser,** بەلەمێکە کە بۆ تێدا ژیان دەست دەدات.
**cabinet** (kab′ə-nit), *n.* (١) دۆلاب؛ دۆلاب بە چەکمەجەوە.
(٢) دۆلابی ئازووقە. (٣) ژووری کۆڕگرتن؛ ژووری کۆبوونەوە.
(٤) کۆڕگرتن؛ کۆبوونەوە لەم ژوورەدا. (٥) [-C]، ئەنجوومەنی وەزیران.
(٦) [Archaic]، ژوورۆچکە. (٧) [.Obs]، خانووچکە.
**cabinetmaker** (kab′ə-nit-māk′ẽr), *n.* وەستا یا دارتاشی دۆلاب و مۆبیلیات.
**cable** (kā′b'l), *n.* (١) گوریس؛ پەت؛ تەلی ئەستوور؛ تەلی کارەبایی ئەستوورو دەورگیراو. (٢) (ا) تەلی برووسکەی ژێردەریایی.
(ب) تەلی تەلەفۆن و کارەبا. (٣) گوریسی لەنگەر.
(٤) پێوانەیەکی درێژی دەریاییە (بریتییە لە ٧٢٠ پێ لە ئەمەریکا و ٦٠٨ پێ لە ئینگلتەرە). (٥) برووسکە.
*v.t.* (١) بە گوریس قایم کردن؛ بە تەلی ئەستوور توندکردن.
(٢) (ا) ناردنی برووسکە بە تەلی ژێردەریاییدا. (ب) برووسکە ناردن یا لێدان.
*v.i.* برووسکە ناردن.
**cable car,** ئوتومبیلێکە بە تەلی ئاسنی ئەستووری ژێرزەمین دەڕوات لەسەر هێڵی ئاسن (وەك لە شاری سان فرانسیسکۆ لە ئەمەریکا).
**cablegram** (kā′b'l-gram′), *n.* برووسکە (کە بە تەلی ژێردەریاییدا دەنێردرێت).
**cable's length,** پێوانەیەکی درێژی دەریاییە (لە ئەمەریکا ٧٢٠ پێ و ٦٠٨ پێ لە ئینگلتەرە).
**cablet** (kā′blit), *n.* گوریسی باریك؛ تەل.
**cabman** (kab′mən), *n.* = **cabdriver.**
**cabob** (kə-bob′), *n.* کەباب؛ گۆشتی برژاو.
**caboodle** (kə-bōō′d'l), *n.* [Slang], دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ؛ هەموو (مرۆڤ، شت)؛ گشت: *( the whole ~ ; the whole kit and ~ )* .
**caboose** (kə-bōōs′), *n.* (١) چێشتخانەی ناو کەشتی.
(٢) فارگۆنی کارگەرانی شەمەندەفەری بار (کە دوا فارگۆنە).
**cabriolet** (kab′ri-ə-lā′, kab′ri-ə-let′), *n.* (١) عەرەبانەیەکی یەك ئەسپی دووپێچکەییە سەرەکەی دەنووشتێتەوە. (٢) ئوتومبیلی تەنتە.
**cabstand** (kab′stand′), *n.* شوێنی وەستانی تەکسی.
**cacao** (kə-kā′ō, kə-kä′ō), *n.* (١) درەختی کاکاو.
(٢) کاکاو: خواردنەوەیەکە وەك قاوە وایە.
**cacao butter,** ڕۆنی کاکاو (لە تۆوی کاکاو دەردەهێنرێ و بۆ ئارایشت بەکاردەهێنرێت).
**cachalot** (kash′ə-lot′, kash′ə-lō′), *n.* نەهەنگێکی گەورەیە.
**cache** (kash), *n.* (١) ئازووقەخانەی نهێنی (بۆ خواردەمەنی و تەقەمەنی).
(٢) شوێنی شاردنەوە یا هەڵگرتنی شتی بەنرخ.
(٣) ئازووقەی شاراوە یا هەڵگیراو (خواردەمەنی، تەقەمەنی... هتد).
*v.t. & v.i.* شت شاردنەوە؛ شت هەڵگرتن لە شوێنی نهێنیدا.
**cachet** (ka-shā′, kash′ā), *n.* (١) مۆر؛ پوول (کە دەنرێت بە داوا–

نامەوە) (٢) نیشانەی ڕاستەقینەیی (٣) مۆری پۆستە.
(٤) شووشەی دەرمانی بۆن پیس.
**cachexia** (kə-kek′si-ə), *n.* لاوازبوون و پووکانەوەی لەش بەهۆی نەخۆشییەکی درێژخایەنەوە.
**cachexy** (kə-kek′si), *n.* = cachexia.
**cachinnate** (kak′ə-nāt′), *v.i.* قاقای پێکەنین ماتن.
**cackle** (kak′'l), *v.i.* (١) گارەگارکردن (مریشك)؛ قرتەقرت کردن.
(٢) قسەکردن یا پێکەنین بە دەنگێکی بەرزو ناسازەوە.
*v.t.* بە دەنگی ناساز ووتن.
*n.* (١) گارەگار؛ قرتەقرت (مریشك، قاز... هتد).
(٢) چەنەبازی؛ قسەی بێ بایەخ. (٣) قاقای پێکەنینی پچڕپچڕ.
**caco-** (kak′ə, kak′ō), پێشگرێکە بەمانای: ناساز؛ خراپ؛ بەد؛ ناشرین: (*cacography, cacophony*).
**cacodemon, cacodaemon** (kak′ə-dē′mən), *n.* شەیتان؛ جنۆکە
**cacoethes** (kak′ō-ē′thēz), *n.* (١) خوویەکی خراپ.
(٢) خولیا؛ کەڵکەڵە (بۆ کردنی شتێکی خراپ).
**cacography** (ka-kog′rə-fi), *n.* (١) دەستوخەتی ناخۆش.
(٢) حونجەی هەڵە
**cacophonous** (kə-kof′ə-nəs), *adj.* گەڕەلاوژێ؛ لەگەڵ یەکتریدا نەگونجاو؛ ناساز (چەند دەنگێك پێکەوە).
**cacophony** (kə-kof′ə-ni), *n.* ناسازی (کۆمەڵە دەنگ)؛ گەڕەلاوژێ؛ لەگەڵ یەك نەگونجان.
**cactus** (kak′təs), *n.* کاکتەس: ڕووەکێکی درك تیژی هەمەچەشنەی بیابانە (لە شێوەی بنچکی بچووك و گەورەو دەوەن و داری بە ئاسمانێدا چوودایە).
**cad** (kad), *n.* پیاوێکی ناکەس و نزم؛ پیاوێکی بەدڕەووشت و نامەرد.
**-caddish** *(adj.)*; caddishly *(adv.)*; caddishness *(n.)*.
**cadaster** (kə-das′tēr), *n.* = cadastre.
**cadastre** (kə-das′tēr), *n.* تۆمارنامەی گشتی پێوان و نرخی خانوو و زەویوزار (بۆ باج گرتن).
**-cadastral** *(adj.)*.
**cadaver** (kə-dav′ēr, kə-dā′vēr), *n.* لاشە (بەتایبەتی کە بۆ توێکاری دانرابێ)؛ لاشەی مردوو.
**-cadaveric** *(adj.)*.
**cadaverine** (kə-dav′ēr-in, kə-dav′ə-rēn′), *n.* ماددەیەکی کیمیایی بۆگەنە
**cadaverous** (kə-dav′ēr-əs), *adj.* لە مردوو دەچێت؛ ڕەنگ زەردو لاوازو چاو بە قووڕچدا چوو.
**caddie, caddy** (kad′i), *n.* (١) پەیامبەر (منداڵ)؛ بەردەستی ووردە – نیش. (٢) بەردەستی یاریکەری گۆڵف (هەڵزەیەکە گورزو کەرەسەی تری یاری گۆڵف بۆ یاریکەرەکە هەڵدەگرێت). (٣) عەرەبانەی بچووکی شت گواستنەوە.
(٤) دەفرێکە خوێندان و شووشەی سرکەو شتی وەهای تێدا دادەنرێت و دەخرێتە سەر مێزی نان خواردن
*v.i.* بەردەستی کردن؛ وورده نیش کردن.
**caddish** (kad′ish), *adj.* ناکەس؛ پیس و بۆگەن؛ نزم.
**caddy** (kad′i), *n.* قوتووی چا
**caddy** (kad′i), *n.* = caddie.
**cadence** (kā′d'ns), *n.* (١) بەرزونزمی دەنگ لە قسەکردندا.
(٢) نزم بوونەوەی دەنگ لە قسەکردندا. (٣) کێش (هەڵبەست).
(٤) ڕەوت (سەماکردن)؛ ڕێك و پێکی هەنگاو (سەما)؛ بەرزونزمی ئاوازی مۆسیقا.
(٥) دوا ئاواز
**-cadenced** *(adj.)*.
**cadency** (kā′d'n-si), *n.* = cadence.
**cadent** (kā′d'nt), *adj.* بەرزونزمی هەیە (دووان)؛ گونجاو (مۆسیقا)؛ ڕێك و پێك و ڕەوت جوان (سەما)؛ کێشدار (هۆنراوە).
**cadet** (kə-det′), *n.* (١) برا بچکۆلە؛ کوڕە بچووکی خێزانێك.
(٢) قوتابی دانشگای ئەفسەری سوپا و هێزی ئاسمانی و دەریایی و پۆلیس
*( an airforce ~ ; a military ~ )*
(٣) [Slang]، گەواد.
**cadetship** (kə-det′ship), *n.* (١) پلەی قوتابی دانشگای ئەفسەری.
(٢) ماوەی خوێندنی قوتابییەکی وەها.
**cadge** (kaj), *v.t. & v.i.* [Colloq.], سواڵکردن؛ دەست پانکردنەوە لە خەڵك.
**cadi** (kä′di, kā′di), *n.* قازی.
**cadre** (kad′ri), *n.* (١) چوارچێوە. (٢) ناوەڕۆك؛ ناوجەرگە.
(٣) کادر؛ تێکۆشەر (چینی کرێکاران، هەموو جۆرە حیزبێك)؛ کەسێکی شارەزا
**caduceus** (kə-dōō′si-əs, kə-dū′si-əs), *n.* (١) گورزی پەیامبەرو خوداکان (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان). (٢) درووشمی پزیشکەوانی (کە بریتییە لە دارێکی باڵدار کە دوو مار خۆیان تێوە ئاڵاندووە).
**-caducean** *(adj.)*.
**caducity** (kə-dōō′sə-ti, kə-dū′sə-ti), *n.* (١) زوو لە کەڵك کەوتن یا پزین (میوە، سەوزە)؛ زوو فەوتان؛ زۆر نەخایاندن. (٢) پیری.
**caducous** (kə-dōō′kəs, kə-dū′kəs), *adj.* (١) (ا) زوو وەریو یا کەوتوو (گەڵا، ئەندامی هەندێ گیانداران). (ب) وەریو؛ دەوەرێت.
(٢) ناهەمیشەیی؛ سەردەمی؛ کاتی؛ زۆر بەردەوام نەبوو.
**caecum, cecum** (sē′kəm), *n.* (١) ڕیخۆڵە کوێرە.
(٢) بۆشایی یا کیسی یەك سەر کراوە (زیندەوەرزانی).
**Caesar** (sē′zēr), *n.* (١) قەیسەر: نازناوی شاهەنشای ڕۆمانەکان بوو.
(٢) (ا) دیکتاتۆر؛ زۆردار (ب) فەرمانڕەوا.
**Caesarean operation ( or section ),** سك هەڵدڕینی قەیسەری بۆ منداڵبوون (دەڵێن گوایە قەیسەری ڕۆما بەم شێوەیە لەدایك بووە).
**Caesarean, Caesarian** (si-zâr′i-ən), *adj.* (١) قەیسەری؛ دیکتاتۆری؛ فەرمانڕەوایی ڕەها.
(٢) Caesarean operation ( or section).
**Caesarism, caesarism** (sē′zēr-iz′m), *n.* زۆرداری؛ دیکتاتۆریتی؛ فەرمانڕەوایی ڕەها.
**Caesar's wife,** کەسێك کە ئەبێ ئەوەندە پاك بێت هیچ گومانی خراپەی لێ نەکرێت.
**caesura** (si-zhoor′ə, si-zyoor′ə), *n.* (١) وەستانێکە لە خوێندنەوەی دێڕی هۆنراوەدا (بۆ پیشاندانی کێش یا ڕەوتی هۆنراوەکە).
(٢) وەستانێکە بەرزونزمی ئاوازی مۆسیقا پیشان دەدات.
**café** (kə-fā′, ka-fā′), *n.* (١) قاوەخانە؛ چایخانە؛ چێشتخانە.
(٢) قاوە. (٣) چێشتخانەو یانەی شەو پێکەوە.
**café au lait,** (١) قاوە بە شیرەوە؛ قاوەو شیر. (٢) ڕەنگی قاوەیی کاڵ.
**café noir,** قاوەی ڕەش؛ قاوەی بێ شیر؛ قاوەی ڕووت.
**cafeteria** (kaf′ə-têr′i-ə), *n.* کافتێریا.
**caffeine, caffein** (kaf′i-in, kaf′ēn′), *n.* کافین.
**caftan, kaftan** (kaf′tən, käf-tän′), *n.* کەوا.
**cage** (kāj), *n.* (١) قەفەز. (٢) ئۆردوگای دیلی جەنگ؛ ژووری قەفەز ئاسای بەندیخانە. (٣) شتێکە کە لە قەفەز بکات (٤) [Archaic]، بەندیخانە.
(٥) ژووری حەوانەوەو چاوەڕێ کردنی یاریکەران لە تەنیشت یاریگای "بێسبۆڵ". (٦) یاری باسکە.
*v.t.* خستنە ناو قەفەزەوە.
**cageling** (kāj′liŋ), *n.* باڵندەی ناو قەفەز.
**cagey, cagy** (kāj′i), *adj.* [Slang], وووریاو خۆ بە دەستەوە نەدەر؛ ڕاڕاکەر لە بەڵێن دان و وەڵام دانەوەداو نەچووە ژێر هیچ بارێك؛ فروفێڵاوی؛ ووریاو ئاگا لە خۆ بوو (بۆ نەکەوتنە هەڵەوە).
**-cagily** *(adv.)*; caginess *(n.)*.
**cahier** (kə-hēr′), *n.* (١) پەڕاو؛ دەفتەر. (٢) ڕاپۆرت.
**cahoots** (kə-hōōts′), *n.pl.* [Slang], هاوکاری (بەتایبەتی لە کاری

ناپەسەندبە؛ بەشداری.

**go cahoots,** [Slang], وەك يەك بەشداربوون.

**in cahoots,** [Slang], بەشدار (لە پیلاندا)؛ بە هاوکاری لەگەڵ:

***(He is in cahoots with the devil.)***

**Caijan** (kā'jən), ***n.*** = **Cajun.**

**caiman** (kā'mən), ***n.*** = **cayman.**

**Cain** (kān), ***n.*** (١) قابیل: یەکەم کوڕی ئادەم و حەوا کە براکەی خۆی کوشت (ئایین). (٢) پیاوکوژ؛ خوێن ڕێژ.

**raise Cain,** [Slang], (١) کردن بە هەرا؛ کردن بە بەزم و ڕەزم (٢) سەرئێشە بۆ نانەوە؛ پشێوی خستنەوە.

**caique** (kä-ēk'), ***n.*** (١) بەلەمی سەوڵ (لە تەنگاوی بۆسفۆردا)؛ قەیاغ. (٢) بەلەمی با

**cairn** (kârn), ***n.*** کەڵەکەبەرد (بۆ نیشانە یا پەیکەری یادەوەری).

**Cairo** (kī'rō), ***n.*** قاهیرە: پایتەختی وڵاتی میسر.

**caisson** (kā'sən), ***n.*** (١) سنوورقی تەقەمەنی. (٢) عەرەبانەی گواستنەوەی تەقەمەنی. (٣) سنووقێکی ئاوبڕە بۆ ئیشکردنی ژێرئاو (٤) سنووقێکی ئاوبڕە بۆ دەرهێنانی کەشتی و بەلەمی نوقوم بوو. (٥) چوارچێوەیەکی سەرئاوکەوتووە دەرگای بەنداوی پێ دادەخرێت.

**caisson disease,** نەخۆشی ژێرئاوکەر: نەخۆشییەکە تووشی مەلەوانی ژێر ئاو دەبێت لە ئەنجامی خێرا هاتنە دەرەوە لە قووڵایی ژێر ئاوەوە لە ئەنجامی پەستانی زۆرەوە بۆ سەر زەوی کە پەستانی کەمترە یا ئاساییە، وە نیشانەکانی ئازاری سنگ و جومگە و ڕەق بوونی ماسولکەیە. (هەروەها پێی دەوترێ: " **diver's disease, tunnel disease** ").

**caitiff** (kā'tif), ***n.*** کەسێکی بۆگەن، ناکەس، یا نزم.

***adj.*** ناکەس؛ پیس و بۆگەن؛ نزم.

**cajole** (kə-jōl'), ***v.t. & v.i.*** دڵ ڕاهێنان بە مەرایی بۆ کردن؛ مەبەستی خۆ بەجێهێنان بە کلکەلەقێ و پشی پشی؛ سازکردن بە هەڵخەڵەتاندن و مەرایی کردن

***(to ~ into doing something; to ~ out of doing something)***

**-cajoler** ***(n.)***; **cajolingly** ***(adv.)***.

**cajolement** (kə-jōl'mənt), ***n.*** سازکردن بە مەرایی و هەڵخەڵەتاندن؛ مەرایی

**cajolery** (kə-jōl'ēr-i), ***n.*** سازکردن بە مەرایی و قسەی خۆش و هەڵخەڵەتاندن.

**Cajun** (kā'jən), ***n.*** (١) دانیشتووی ویلایەتی " لویزیانا " ی ئەمەریکی لە بنەچەی فەرەنسی (٢) زمانی ئەم ڕەگەزە.

**cake** (kāk), ***n.*** (١) کێك (٢) پارچە ماسی یا سەوزەی سوورەوەکراو. (٣) قاڵب (سابوون، سەهۆڵ).

**a piece of cake,** [Colloq.], زۆر ئاسان (کار، تاقیکردنەوە):

***(That job was a piece of cake.)***

**take the cake,** [Slang], (١) بردنەوە (ملەملێ)؛ پاداشت وەرگرتن. (٢) تێیدا سەرکەوتن؛ زۆر تێیدا باش بوون.

**cakes and ale,** خۆشی ژیان

**cakewalk** (kāk'wôk'), ***n.*** سەمایەکی قولەڕەشەکانی ئەمەریکایە.

***v.i.*** کردنی ئەم سەمایە

**calabash** (kal'ə-bash'), ***n.*** (١) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە. (٢) بەری کوولەکەیی ئەم درەختە. (٣) ئەم بەرە کوولەکەییە بە ووشك کراوەیی (وەك دەفر بەکاردەهێنرێت). (٤) کوولەکە.

**calaboose** (kal'ə-bōōs', kal'ə-bōōs'), ***n.*** [Slang]. بەندیخانە

**calamander** (kal'ə-man'dēr, kal'ə-man'dēr), ***n.*** دارێکی سەختی قاوەیی خەت خەتە لە توخمی دارخەیزەرانە.

**calamary** (kal'ə-mâr'i, kal'ə-mēr-i), ***n.*** ماسییەکی بچووکە.

**calamitous** (kə-lam'ə-təs), ***adj.*** کارەساتی؛ ناخۆش؛ بە ڕەی.

**calamity** (kə-lam'ə-ti), ***n.*** کارەسات؛ لێقەومان؛ ناخۆشی؛ بەڵا.

**calamus** (kal'ə-məs), ***n.*** (١) ڕووەکێکی گەڵا باریکە لە شوێنی شێدارا دەڕوێت. (٢) ڕەگی بۆن خۆشی ئەم ڕووەکە. (٣) درەختێکی دارخورماییە قەفەکەی دەکرێت بە گۆچان یا داردەست (٤) قەفی پەڕ.

**calash** (kə-lash'), ***n.*** (١) گالیسکەیەکی سەر نوشتاوەیە. (٢) سەری ئەم گالیسکەیە. (٣) کڵاوێکی ژنانەیە دەنوشتێنرێتەوە.

**calcancum** (kal-kā'ni-əm), ***n.*** = **calcaneus.**

**calcaneus** (kal-kā'ni-əs), ***n.*** پاژنەی پێ؛ ئێسقانی پاژنەی پێ.

**calcar** (kal'kär), ***n.*** چوقوڵ (بەتایبەتی هی لاق و باڵی باڵندەی وەك قەل و مریشك).

**calcarate** (kal'kə-rāt', kal'kə-rit), ***adj.*** چوقوڵاوی (ووشەی پێشوو ببینە).

**calcareous** (kal-kâr'i-əs), ***adj.*** گەچی؛ کالسیۆمی.

**calcariferous** (kal'kə-rif'ēr-əs), ***adj.*** = **calcarate.**

**calces** (kal'sēz), ***n.*** *alternative plural of* **calx.**

**calcic** (kal'sik), ***adj.*** گەچی؛ کالسیۆمی.

**calciferous** (kal-sif'ēr-əs), ***adj.*** کلسدار؛ گەچ یا کالسیۆمی تێدایە.

**calcific** (kal-sif'ik), ***adj.*** = **calciferous.**

**calcification** (kal'sə-fi-kā'shən), ***n.*** (١) ڕەق بوون (ئێسقان)؛ ڕەق کردن؛ کالسیۆماوی کردن. (٢) شتێکی ڕەق بوو یا کالسیۆماوی کراو.

**calcify** (kal'sə-fī'), ***v.t. & v.i.*** ڕەق بوون (وەك ئێسقان)؛ ڕەق کردن.

**calcination** (kal'sə-nā'shən), ***n.*** (١) ڕەق بوون؛ ڕەق کردن. (٢) سووتان (گەچ)؛ ووشك کردنەوە بە گەرمای بەتین.

**calcine** (kal'sīn', kal'sin), ***v.t. & v.i.*** سووتان (گەچ)؛ کردن بە گەچ؛ بوون بە گەچ.

**calcium** (kal'si-əm), ***n.*** کالسیۆم؛ گەچ.

**calcium phosphate,** فۆسفاتی کالسیۆم (کە لە ددان و ئێسقاندا هەیە).

**calcography** (kal-kog'rə-fi), ***n.*** وێنەکردن بە قەڵەم بۆیە.

**calculable** (kal'kyoo-lə-b'l), ***adj.*** دەژمێردرێت؛ دەتوانرێت بژمێردرێت.

**calculate** (kal'kyoo-lāt'), ***v.t.*** (١) ژماردن. (٢) لێکدانەوە. (٣) نەخشەدانان؛ ڕێکخستن (٤) بۆ ئەو مەبەستە کردن:

***(The advertisement is ~d to attract young customers.)***

(٥) [Colloq.]، وازانین؛ وادانان؛ والێکدانەوە.

***v.i.*** (١) ژماردن. (٢) ( **on** ~ )، پشت پێ بەستن؛ بەتەمابوون.

**calculated** (kal'kyoo-lā'tid), ***adj.*** (١) ژمێردراو. (٢) باش بیری لێ کراوەتەوە؛ باش لێی کۆڵراوەتەوە: ***(a ~ risk)*** (٣) بۆ مەبەستێکی تایبەتی کراو. (٤) لەوانەیە؛ زۆر بۆی هەیە. (٥) دەستەنقەست: ***(a ~ effort)***.

**calculating** (kal'kyoo-lā'tiŋ), ***adj.*** (١) ژمێرەر (مەکینە): ***(a ~ machine)***

(٢) هەمووشت لێکدەرەوە بۆ سوودی خۆ؛ سوودی خۆ پەرست؛ دووربین: ***(a ~ person)***

**calculating machine,** ئامێری ژمێرەر؛ پێژمێر.

**calculation** (kal'kyoo-lā'shən), ***n.*** (١) ژماردن. (٢) نەخشە؛ پلان. (٣) دووربینی؛ وریایی و زۆرزانی.

**calculator** (kal'kyoo-lā'tēr), ***n.*** (١) ژمێریار (مرۆڤ)؛ پێژمێر بەکارهێنەر. (٢) خشتەی ژماردن. (٣) پێژمێر؛ ئامێری ژمێرەر.

**calculous** (kal'kyoo-ləs), ***adj.*** بەردی گورچیلەی هەیە؛ لە ئەنجامی بەردی گورچیلەوەیە.

**calculus** (kal'kyoo-ləs), ***n.*** (١) بەردی گورچیلە (پزیشکەوانی). (٢) جیاکاری و تەواوکاری (بیرکاری): (أ) شێوەیەکی ژماردنە. (ب) شێوەیەکی لێکدانەوەیە. (ج) پەرتووکی جیاکاری و تەواوکاری. (د) کۆرس یا وانەی جیاکاری و تەواوکاری.

**caldron, cauldron** (kôl′drən), *n.* حەوجۆش: مەنجەڵی قورس؛ کتڵی‌یەکی گەورەو قورس.
**calefactory** (kal′ə-fak′tə-ri), *adj.* گەرمکەرەوە (دەرمان)؛ گەرم.
*n.* (١) ژوورێکی گەرمی دانیشتن لە پەرستگادا. (٢) مەنجەڵ.
**calendar** (kal′ən-dẽr), *n.* (١) سالنامە؛ ڕۆژنامە؛ ڕۆژژمێر.
(٢) لیستەی داوا (دادگا).
*v.t.* (١) خستنە ناو ڕۆژنامە یا سالنامەوە. (٢) کات بۆ دانان.
**calendar day,** شەو و ڕۆژێك: لە نیوە شەوێکەوە بۆ نیوە شەوی داهاتوو؛ بیست‌وچوار سەعات.
**calendar year,** سالی ڕۆژنامەیی: لە ١ ی کانوونی دووەمەوە هەتا سی‌ویەکی کانوونی یەکەم) (جیاوازە لە سالی دارایی کە پێی دەوترێ: " fiscal year ").
**calendar** (kal′ən-dẽr), *n.* (١) ئامێری ساف‌ولووسکەری کاغەزو قوماش. (٢) کارپێکەری ئەم ئامێرە.
*v.t.* کاغەزو قوماش ساف‌و لووس کردن بەم ئامێرە.
**calendar** (kal′ən-dẽr), *n.* دەروێشی گەڕۆك؛ قەلەندەر.
**calendula** (kə-len′jə-lə), *n.* (١) گوڵە چاوئێشە؛ بەیبوونە کێویلە؛ هەمیشە بەهار. (٢) گوڵی ووشك کراوەی ئەم ڕووەکە کە بۆ دەرمان بەکاردێت.
**calf** (kaf, käf), *n.* (١) گوێرەکە.
(٢) بەچکەی فیل‌و نەهەنگ‌و مانگای دەریا.
(٣) پارچەیەك سەهۆڵی گەورە کە لە شاخی سەهۆڵ بووبێتەوە.
(٤) دوورگەیەکی بچووك بەتەنیشت دوورگەیەکی گەورەوە.
(٥) چەرمی گوێرەکە.
(٦) [Colloq.]، هەرزەیەکی حۆل نەزانی ڕەووشت منداڵانە.
**kill the fatted calf,** بەخێرهاتنێکی گەرم کردن؛ گوێرەکە بۆ سەربڕین (لە کوردەواریدا دەڵێین: مەڕ بۆ سەربڕین).
**calf** (kaf, käf), *n.* پووز
**calf love,** [Colloq.], دلداری هەرزەکاری.
**calf skin,** (١) پێستەی گوێرەکە. (٢) چەرمی گوێرەکە.
**caliber, calibre** (kal′ə-bẽr), *n.* (١) سەنگی گوللە؛ گەورەو بچووکی فیشەك. (٢) تیرەی لوولە تفەنگ. (٣) تیرەی لوولەیەك.
(٤) سەنگ (مرۆڤ)؛ پلەی توانا و ڕەووشت؛ چۆنێتی؛ پلە (باشی‌و خراپی):
[ *a man of high ( or poor ) ~* ]
**calibrate** (kal′ə-brāt′), *v.t.* (١) پێوان‌و پلە پلە کردن.
(٢) چاك کردن یا ڕاستکردنەوەی ئامێرێکی پێوان (وەك گەرماپێو).
**-calibration** *(n.).*
**calices** (kal′i-sēz′), *n. plural of* calix.
**calico** (kal′ə-kō′), *n.* بلووری: خام؛ چیت.
*adj.* لە بلووری، خام. یا چیت دروستکراو.
**calico bass,** ماسی‌یەکی بچووکی ناو ڕووبارە.
**calif** (kā′lif, kal′if), *n.* = **caliph.**
**califate** (kal′ə-fāt′, kal′ə-fit), *n.* = **caliphate.**
**californium** (kal′ə-fôr′ni-əm), *n.* کالیفۆرنیەم: ماددەیەکی کیمیایی تیشکی ئەتۆمی‌یە
**caliginous** (kə-lij′ə-nəs), *adj.* تاریك؛ لێل؛ نادیار.
**calipash** (kal′ə-pash′, kal′ə-pash′), *n.* شتێکی سەوزی لیقنە لەژێر قاوغی سەرپشتی کیسەڵی ئاویدا هەیەو دەخورێت.
**calipee** (kal′ə-pē′, kal′ə-pē′), *n.* شتێکی زەردی لیقنە لەژێر قاوغی ژێر سکی کیسەڵی ئاویدا هەیەو دەخورێت.
**caliper, calliper** (kal′ə-pẽr), *n.* ئامێری پێوانی ئەستووری یا تیرەی شتێك.
**caliph** (kā′lif, kal′if), *n.* خەلیفە
**caliphate** (kal′ə-fāt′, kal′ə-fit), *n.* (١) پلەو دەسەلاتی خەلیفە؛ خەلافەت. (٢) خەلیفەنشین.
**calisthenic, callisthenic** (kal′əs-then′ik), *adj.* تایبەتی بە وەرزشی لەش بەهێزو تەندرووست کردن.
**calisthenics, callisthenics** (kal′əs-then′iks), *n.pl.* (١) وەرزش؛ مەشقی وەرزشی؛ یاری لەش بەهێزکردن.
(٢) (*sing.*)، لەش بەهێزو تەندرووست کردن بە وەرزش.
**calix** (kā′liks), *n.* = **chalice.**
**calk** (kôk), *v.t.* = **caulk.**
**calk** (kôk), *n.* (١) چوقوڵی بن ناڵی وولاخ بۆ نەخلیسکان.
(٢) ناڵی بنی پێلاو.
*v.t.* (١) ناڵ لە بنی پێلاو دان. (٢) بریندارکردن بە چوقوڵی بن ناڵ.
**calker** (kôk′ẽr), *n.* = **caulker.**
**calker** (kôk′ẽr), *n.* = **calk.**
**call** (kôl), *v.t.* (١) بانگ کردن. (٢) ناولێنان؛ ناونان؛ پێ ووتن (ناو).
(٣) ناوی خراپ لێنان؛ پێ ووتن (ناوی خراپ): *( He ~ed her names.)*
(٤) کۆڕ پێ گرتن؛ کۆکردنەوە؛ بانگ کردن بۆ کۆبوونەوە:
*( to ~ a meeting of parliament)*
(٥) گرتن بە سەرباز: *( He was ~ed to the army.)* .
(٦) داوالێکردن؛ بانگ بۆ دان؛ بانگ کردن (بۆ کردنی شتێك).
(٧) خوێندنەوە بە دەنگی بەرز (لیستی ناو)؛ یەك بە یەك بانگ کردن:
*( The teacher ~ed the roll.)*
(٨) لە خەو هەڵساندن؛ خەبەرکردنەوە. (٩) نیشان پێدان؛ نیشانە بۆ ناردن.
(١٠) تەلەفۆن بۆ کردن: *( I ~ed you last night.)* .
(١١) وادانان؛ پێ ووتن: *( Do you ~ English an easy language?)*
(١٢) خوێندن (باڵندە، گیاندار)؛ قاسپاندن.
(١٣) وەستاندن (یاری، شەڕ... هتد): *( He ~ed a halt to the game.)* .
(١٤) داوای قەرزکردنەوە هەمووی بە یەك جارو پێش کاتی خۆی (لەڕووی سزاوە): *( The bank can ~ the loan.)* .
(١٥) پێشەکی مەبەست دەرخستن (یاری).
(١٦) داوای دەست پیشاندان کردن (یاری پۆکەر)
*v.i.* (١) بانگ کردن؛ بانگدان؛ هاوارکردن.
(٢) سەرلێدان؛ دیدەنی کردن: *( I ~ed on Mr. Smith at his office.)* .
(٣) تەلەفۆن کردن. (٤) داوای دەست پیشاندان کردن (یاری پۆکەر).
*n.* (١) بانگ؛ بانگەواز؛ هاوار؛ قیژە.
(٢) بانگ کردن (نان خواردن، کۆڕ، دادگا... هتد)؛ داوای هاتن لێکردن
(٣) دەنگ (زەنگ، کەرەنا). (٤) (ا) خوێندن (باڵندە): *( a bird ~ )* .
(ب) ئامێرێك کە لاسایی ئەم خوێندنەوەی پێ بکرێت (ڕاوکردن).
(ج) دەنگی گیاندار (وەك لوورە).
(٥) پێویستی: *( There was no ~ for that remark.)* .
(٦) داواکردن؛ داوا: *( a ~ for low-priced books)* .
(٧) ئەرکی سەرشان: *( the ~ of duty)* .
(٨) تەلەفۆن: *( a telephone ~ ; to make a ~ )* .
(٩) ئەرکی ئاینی. (١٠) لیستەی ناو خوێندنەوە: *( a roll ~ )*
(١١) سەردان (بەتایبەتی هی کورت‌و بە ئیش). (١٢) بریاری سەرپشك (یاری).
(١٣) داوای قەرزدانەوە.
(١٤) حەز؛ دڵ پێوەبوون؛ ڕاکێشران: *( the ~ of the wild)*
**a close call.** لە پێوەبوون، تووش بوون، یا کارەساتەوە نزیك بوون؛ بە ئاستەم ڕزگاربوون (لە لێقەومان یا کارەسات):
*( while driving on the icy road, we had a couple of close calls.)*
**call attention to,** سەرنج ڕاکێشان.
**call a spade a spade,** قسە لەڕوو بوون؛ بە ئاشکراو بێ شەرم‌و شکۆ قسەکردن.
**call back,** (١) داوای گەڕاندنەوە کردن. (٢) کشاندنەوە؛ کێشانەوە.
(٣) تەلەفۆن بۆ کردنەوە.
**call down,** (١) داوا لە خودا کردن. (٢) [Slang] ، سەرزەنشت کردن.
**call for,** (١) داواکردن؛ پێویست بوون:

***(The occasion calls for quick action; to call for free elections, a general strike, etc.)***

(٢) چوون بە شویندا؛ هاتن بە دوای کەسێك یا شتێكدا:

***(I will call for you at six o'clock and we'll go to the theatre.)***

**call forth,** كۆكردنەوە (هێزو توانا)؛ هێنانە پێشەوە؛ بانگ كردن‌و خستنە ڕوو. ***(You will have to call forth all your energy.)***

**call in,** (١) بانگ كردن (بۆ یارمەتی یا ڕاوێژكردن):

***(Call in a doctor at once.)***

(٢) كێشانەوە لە بازاڕ یا لە دەستاودەست كردن.

(٣) داواكردنەوە (قەرز).

**call into question,** گومان لێكردن؛ گومان لێ هەبوون.

**call off,** (١) فەرمان دان بە وەستاندنی هێرش؛ ڕاگرتن.

(٢) خوێندنەوە بە دەنگی بەرز (لیستەی ناو).

(٣) [Colloq.]. هەڵوەشاندنەوە:

***(to call off a meeting, a date, etc.)***

**call of nature,** میزهاتن؛ گووهاتن.

**call on (or upon),** (١) سەرلێدان (بۆ ماوەیەكی كورت).

(٢) داوالێكردن؛ بانگ كردن (بۆ كردنی كارێك):

***(He called on his countrymen to unite.)***

**call one's bluff,** بە كەسێك وتن ئەمە ئەرزو ئەمە گەز.

**call out,** (١) هاواركردن؛ قیژاندن؛ ناڵاندن (٢) بانگ كردن.

(٣) بەربەرەكانی كردن؛ ڕووبەڕوو وەستان.

**call a person names,** قسەی سووك یا خراپ پێ ووتن:

***(He called her names.)***

**call the roll,** لیستەی ناو خوێندنەوە:

***(The teacher calls the roll every day.)***

**call the shots,** بڕیار بەدەست بوون؛ هەمووشت بەدەست بوون:

***(His wife is calling the shots.)***

**call the tune, = call the shots.**

**call to account,** لێپرسینەوە:

***(He ought to be called to account.)***

**call to mind,** هاتنەوە بیر؛ بیركەوتنەوە.

**call to order,** كۆڕگرتن؛ داوای بێ دەنگی لێكردن‌و دەست بە كۆڕگرتن كردن. ***(He called the meeting to order.)***

**call up,** (١) هاتنەوە بیر؛ بیركەوتنەوە؛ لەبیربوون.

(٢) گرتن بە سەرباز؛ بانگ كردن بۆ سەربازی.

(٣) تەلەفۆن بۆ كردن: ***(I called her up yesterday.)***

**call upon,** داوالێكردن؛ داوالێكران:

***(You may be called upon to do several jobs.)***

**on call,** (١) ئامادەیە هەر كاتێك كە بانگ كرا:

***(Two doctors are on call always.)***

(٢) دەبێت بدرێتەوە هەر كاتێك داوای كرا (قەرز).

**pay (someone) a call,** سەرلێدان؛ دیدەنی كردن.

**within call,** دەنگی دەگاتێ؛ نزیك.

**calla** (kal'ə), ***n.*** (١) ڕووەكێكی گوڵ سپی و گەورەیە

(٢) گوڵی ئەم ڕووەكە.

**callboard** (kôl'bôrd', kôl'bōrd'), ***n.*** تەختەی ئاگاداری.

**callbox** (kôl'boks'), ***n.*** تەلەفۆنی سەر ڕێگاوبان (بۆ ئاگاوی وەك ئوتومبێل پەككەوتن... هتد).

**callboy** (kôl'boi'), ***n.*** (١) كوڕێكە ئوێنەران بانگ دەكات بۆ سەر شانۆ كە نۆبەیان هات (٢) بەردەستی ئوتێل.

**caller** (kôl'ēr), ***n.*** (١) بانگكەر (مرۆڤ، گیاندار، باڵندە، شت).

(٢) میوان (بەتایبەتی بۆ ماوەیەكی كورت)؛ دیدەنیكەر؛ سەرلێدەر.

**caller** (kal'ēr, kä'lēr), ***adj.*** (١) تازە (میوە، سەوزە، خواردەمەنی).

(٢) خۆش (سروە، ئاووهەوا)؛ فێنك (با).

**call girl,** [Slang], قەحبە (بەتایبەتی كە بە تەلەفۆن ژووانی لەگەڵ ڕێك بخرێت).

**calligrapher** (kə-lig'rə-fēr), ***n.*** خۆشنووس؛ دەسخەت خۆش

**calligraphy** (kə-lig'rə-fi), ***n.*** (١) خۆشنووسی؛ خەتخۆشی

(٢) دەسخەت؛ نووسین.

-calligraphic ***(adj.)***; calligraphist ***(n.)***.

**calling** (kôl'iŋ), ***n.*** (١) بانگ كردن؛ بانگ. (٢) پیشە؛ كار.

(٣) هەستێك كە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت بۆ كردنی شتێك (بەتایبەتی كاری لەخۆبوردن‌و چاكە).

**calling card,** كارتی سەردان: كارتێكی تایبەتییە بە كەسێك كە ئەگەر سەردانی شوێنێكی كردو كەسی لێ نەبوو، ئەوا ئەو كارتە بەجێ دەهێڵێت

**Calliope** (kə-lī'ə-pē'), ***n.*** (١) خودای زمانپاراوی‌و هۆنراوەی داستانی. (٢) [c-]، ئامێرێكی مۆسیقایە فووی پیا دەكرێت.

**calliper** (kal'ə-pēr), ***n. & v.t.*** = caliper.

**callisthenics** (kal'əs-then'iks), ***n.pl.*** = calisthenics.

**call loan,** قەرزێكە كە دەبێت بدرێتەوە هەركاتێك داوای كرایەوە.

**call money,** پارەیەكی قەرزكراوە كە دەبێت بدرێتەوە هەركاتێك داوای كرایەوە.

**call number,** ژمارەی پەڕتووك (بۆ دیاریكردنی شوێنی پەڕتووكەكە لە كتێبخانەیەكدا)؛ ناونیشانی پەڕتووك.

**callosity** (kə-los'ə-ti, ka-los'ə-ti), ***n.*** (١) ڕەقی.

(٢) دڵڕەقی؛ بێ بەزەییتی؛ بێ هەستی. (٣) مێخەكە؛ پێستی ڕەق‌و مردوو.

**callous** (kal'əs), ***adj.*** (١) مێخەكەدار؛ ڕەق‌و مردوو (پێست).

(٢) دڵڕەق؛ بێ بەزەیی.

**callow** (kal'ō), ***adj.*** (١) پەڕوباڵ دەرنەكردوو؛ زەرنەقووتە.

(٢) هەرزە؛ كاڵ‌وكرچ (مرۆڤ)؛ نەزان؛ نەشارەزا.

**call to quarters,** بانگ كردنەوەی سەرباز بۆ قاوشەكانیان (بە تەپڵ یا كەڕەنا).

**callus** (kal'əs), ***n.*** (١) مێخەكە؛ پێستی ڕەق‌و مردوو.

(٢) ماددەیەكە ئێسقانی شكاو دەری دەدات بۆ سارێژبوونەوەی.

(٣) ڕیشاڵی دەوروپشتی برین یا برواوییەكی سارێژبوو (ڕووەكزانی).

**calm** (käm), ***n.*** كپی؛ بێ دەنگی؛ كش‌وماتی؛ خامۆشی؛ هێمنی.

***adj.*** كپ؛ بێ دەنگ؛ كش‌ومات؛ خامۆش؛ هێمن؛ لەسەرخۆ.

***v.t. & v.i.*** **(~ down),** هێمن كردنەوە؛ هێمن بوونەوە؛ خاوبوونەوە؛ دڵنەوایی كردن؛ هێنانەوە سەرخۆ؛ هاتنەوە سەرخۆ:

***(We ~ed him down.; The sea ~ed down.)***

-calmly ***(adv.)***; calmness ***(n.)***.

**calmative** (kal'mə-tiv, käm'ə-tiv), ***adj.*** هێمنكەرەوە؛ ئازاركوژ (پزیشكەوانی).

***n.*** دەرمانی ئازاركوژ.

**caloric** (kə-lôr'ik, kə-lor'ik), ***n.*** (١) ماددەیەكە لە كۆندا وایان دانابوو كە دەبێتە هۆی سووتاندن‌و گەرمی. (٢) گەرمی؛ گەرما؛ گەرمایی

***adj.*** تایبەتی بە گەرما.

**calorie, calory** (kal'ə-ri), ***n.*** كالۆری: یەكەی گەرمی (خواردن).

**calorific** (kal'ə-rif'ik), ***adj.*** گەرماپێدەر؛ گەرما پێكهێنەر.

**calorimeter** (kal'ə-rim'ə-tēr), ***n.*** گەرماپێو (بەتایبەتی گەرمای پەیدابوو لە ئاوێتەی كیمیایی‌و لە لێكخشاندندا).

**calory** (kal'ə-ri), ***n.*** = calorie.

**calotte** (kə-lot'), ***n.*** (١) كڵاو. (٢) كڵاوی بێ قەراغی قەشەی كاسۆلیكی.

(٣) پۆپنە؛ پۆپنەی كڵاوی.

**caloyer** (kal'ə-yēr, kə-loi'ēr), ***n.*** قەلەندەری كڵێسەی ڕۆژهەڵاتی.

**calpac, calpack, kalpak** (kal'pak), ***n.*** كڵاوێكی گەورەی قووچە وەك لباد.

**caltrop, caltrap** (kal'trəp), ***n.*** (١) پارچەیەك ئاسنی چوار-

چوکلەیە لەسەر ڕێی ئەسپ سواری دوژمندا دادەنرێت بۆ ڕاگرتنیان.
(٢) ئاسنێکی وەهایە تایەی ئوتومبیل پەنچەر دەکات.
(٣) ڕووەکی گوڵو بەر درکاوی.
**calumet** (kal′yoo-met′, kal′yoo-met′), *n.* سەبیلێکی درێژی هیندییەکانی ئەمەریکایە.
**calumniate** (kə-lum′ni-āt′), *v.t. & v.i.* ناو پیس کردن؛ لەکەدارکردن؛ بەدناوکردن؛ بوختان بۆ کردن.
**-calumniation** *(n.)*; **calumniator** *(n.)*.
**calumnious** (kə-lum′ni-əs), *adj. Also* **calumniatory**, ناو- پیسکەر؛ مەبەستی بەدناو کردنە؛ درۆ؛ بوختان؛ سووککەر.
**calumny** (kal′əm-ni), *n.* بەندوباو؛ درۆ (بۆ لەکەدارکردنی کەسێك)؛ بوختان؛ قسەی هەڵبەستراو (بۆ ناو سووك کردن).
**calvaria** (kal-vâr′i-ə), *n.* تەوقەسەر.
**Calvary** (kal′və-ri), *n.* (١) شوێنی لە سێدارەدانی عیسا.
(٢) [c-]، پەیکەری عیسای لە سێدارە دراو.
**calve** (kav, käv), *v.i. & v.t.* (١) زاین (مانگا)؛ گوێرەکە بوون.
(٢) پارچە سەهۆڵ لێبوونەوە (شاخی سەهۆڵ).
**Calvinism** (kal′vin-iz′m), *n.* کالڤینیزم: ئاین و بیروباوەڕی " کالڤن " (زانای ئاینی پرۆتستانتی فەرەنسی ١٥٠٩-١٥٦٤ پ.ز.) کە دەڵێت: چارەنووسی مرۆڤ هەر لەپێش لەدایکبوونییەوە نووسراوەو تەنها لەڕێی دڵنەرمی خوداوە مرۆڤ دەچێتە بەهەشت نەك لەبەر کرداری باشی خۆی.
**-calvinist** *(n.)*; **calvinistic** *(adj.)*.
**calvities** (kal-vish′i-ēz′), *n.* سەر ڕووتاوەیی.
**calx** (kalks), *n.* ( *pl.* **calxes, calces** ), (١) گەچ
(٢) خۆڵەمێشی (کانزا سووتاندن)
**calyces** (kal′ɔ-sēz′, kā′lɔ-sēz′), *n. plural of* **calyx**.
**calycine** (kal′i-sin, kal′i-sīn′), *adj.* تایبەتی بە گەڵا سەوزەکانی دەوری خونچەو گوڵ.
**calypso** (kə-lip′sō), *n. & adj.* جۆرە گۆرانی و مۆسیقایەکی بەجۆشی ناوچەی " ترینیداد "ە.
**calyx** (kā′liks, kal′iks), *n.* گەڵا سەوزەکانی دەوری خونچەو گوڵ.
**cam** (kam), *n.* پارچەیەکی قۆقزی مەکینەیەك یا شتێکی خولاوەیە.
**camaraderie** (kä′mə-rä′dēr-i, kä′mə-rä′də-rē′), *n.* هەست یا پەیوەندی برادەرایەتی؛ هاوڕێیەتی
**camarilla** (kam′ə-ril′ə), *n.* (١) ژووری کۆڕگرتن یا کۆبوونەوەی تایبەتی (٢) تاقمە ڕاوێژکاری نهێنی پاشای ئیسپانی کۆن.
(٣) ڕاوێژکارانی نهێنی؛ دەستە ڕاوێژکاری نهێنی.
**camber** (kam′bēr), *n.* (١) کووری (ڕێگە)؛ قەمووری (ڕێگە، پشتی کەشتی). (٢) پارچە دارێکی کووڕ.
*v.t. & v.i.* کووڕبوون؛ کووڕکردن؛ قۆقزکردن.
**cambist** (kam′bist), *n.* (١) پارەگۆڕەرەوە (مرۆڤ).
(٢) پەیڕەوی گۆڕینەوەی پارەی بێگانەو پێوانەو کێشانە.
**cambium** (kam′bi-əm), *n.* چینە شانەی نێوان توێکڵو داری درەختو ڕووەك (کە توێکڵی تازەو دارکی لێ پەیدا دەبێت).
**came** (kām), *past tense of* **come**.
**camel** (kam′'l), *n.* (١) وشتر: (ا) وشتری عەرەبی؛ وشتری یەك کۆپارە " Arabian camel " کە پێشی دەووترێ: " dromedary " . (ب) وشتری دوو کۆپارە " Bactrian camel " .
(٢) سنووقێکی لوولەکی ئاوبڕە کەشتی و بەلەمی نوقوم بووی پێ دەردەهێنرێتەوە (پێشی دەووترێ " caisson " ).
**cameleer** (kam′'l-êr′), *n.* وشترەوان.
**camellia** (kə-mēl′yə, kə-mel′i-ə), *n.* (١) کەمیلیا: درەختو بنچکێکی هەمیشە سەوزی گەڵا بریقاوەی گوڵ سوورو سپییە.
(٢) گوڵە کەمیلیا.
**camelopard** (kə-mel′ə-pärd′, kam′'l-ə-pärd′), *n.* (١) زەرافە. (٢) [C-]، کۆئەستێرەی ووشترمرغ (ئەستێرەوانی).
**Camelot** (kam′ə-lot′), *n.* شارێکی ئەفسانەیی ئینگلیزییە پایتەختی " ئارسەر " پاشا بووە.
**camel's-hair** (kam′'lz-hâr′), *adj. Also* **camel-hair**, لە تووك یا کوڵکی وشتر دروستکراو.
**camel's hair,** (١) کوڵکی ووشتر؛ تووکی ووشتر.
(٢) قوماش یا بەرگی تووکە ووشتر.
**Camembert cheese,** پەنیرێکی نەرمی فەرەنسییە.
**cameo** (kam′i-ō′, kam′yō′), *n.* (١) بەردێکی بەنرخی دووتوێی نەخش دەرپۆقیوە. (٢) نەخشی دەرپۆقیوی سەر بەردێکی بەنرخ.
(٣) خۆنوواندنێکی کورتی لەپڕو چاوەڕوان نەکراوی ئەکتەرێك یا کەسێکی بەناوبانگ لە پەردەی فیلمێکی تەلەفزیۆنیدا:
*( a ~ appearance; a ~ role)*
**camera** (kam′ēr-ə), *n.* (١) فەرمانگەی دادپرس؛ ژووری دادگەر.
(٢) کامێرا.
**in camera,** (١) لە فەرمانگەی دادپرسدا. (٢) بە نهێنی.
**cameral** (kam′ēr-'l), *adj.* (١) تایبەتی بە فەرمانگەی دادپرس؛ تایبەتی بە دادپرسی (کە لەم فەرمانگەیەدا جێبەجێ دەکرێت).
(٢) تایبەتی بە ئەنجوومەنێك کە کاروباری خەڵك بەڕێوە دەبات؛ تایبەتی بە کاروباری دارایی گشتی.
**cameraman** (kam′ēr-ə-man′), *n.* وێنەگر (فیلمی سینەمایی).
**camera obscura,** ژووری تاریك.
**camise** (kə-mēs′), *n.* کراس.
**camisole** (kam′ə-sōl′), *n.* (١) ژێرکراسی بێ قۆڵی ژنانە.
(٢) کراسی شەوی ژنانە.
**camomile, chamomile** (kam′ə-mīl′), *n.* گوڵە بەیبوون؛ گوڵە چاوێنشە؛ گوڵە فەقێ.
**camouflage** (kam′ə-fläzh′), *n.* (١) ڕووخسار گۆڕینی کەرەسەی جەنگو سوپا بە بۆیەو گەڵاو شتی وەها بۆ بەهەڵەدابردنی دوژمن.
(٢) خۆگۆڕین بۆ هەڵخەڵەتاندن؛ دەماغ کردن.
(٣) بەهەڵەدابردن؛ خەڵەتاندن؛ فێڵوتەڵەکە.
*v.t. & v.i.* گۆڕینی ڕووخساری مرۆڤ یا شت بۆ هەڵخەڵەتاندنی ناحەزان؛ بەهەڵەدابردن؛ خەڵەتاندن.
**camoufleur** (kam′ə-flūr′), *n.* شارەزای ڕووخسار گۆڕین بۆ مەبەستی هەڵخەڵەتاندن (ووشەی پێشوو ببینە).
**camp** (kamp), *n.* (١) (ا) ئۆردوگا؛ خێوەتگای سەرباز.
(ب) ئۆردوو؛ لەشکری ناو خێوەتگا.
(٢) دەستە یا تاقمی هاوبیروڕا: *( You and I belong to different ~s.)* .
(٣) خێوەتگا؛ هەوارگە.
(٤) چادرگای منداڵانی قوتابخانە لە کاتی پشوودا.
(٥) ژیانی سەربازێتی یا ئەفسەرێتی.
(٦) نیشتەجێی چادرگا.
*v.i.* (١) چادر هەڵدان؛ خێوەت هەڵدان؛ بارخستن؛ هەوار هەڵدان:
*( Where shall we ~ tonight?)*
(٢) ( **~ out** )، چوونە هەوارگە؛ چوونە چادرگا؛ لە هەوارگە نووستن.
*v.t.* (١) خستنە ئۆردوگا؛ لە چادرگادا دانان. (٢) جێی حەوانە پێدان.
**in the same camp,** هاوبیروباوەڕ؛ هاوپەیمان؛ لە هەمان دەستە یا تاقم.
**camp** (kamp), *n. & adj.* (١) ڕەووشتی ژنانەو حیزانەو خۆنوواندنێکی سووكو ناپەسەند. (٢) دەربڕینی ئەم ڕەووشتە بەتایبەتی لە هونەرو ڕیژەدا.
**campaign** (kam-pān′), *n.* (١) هێرشی سوپایی؛ شاڵاو؛ پەلامار:
*( a military ~ )*
(٢) هێرشی ڕامیاری (هەڵبژاردن)؛ هێرش (ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، بازرگانی، سوپایی... هتد): *( the presidential ~ ; a political ~ )* .
*v.i.* لە هێرشدا بەشداربوون؛ هێرش ڕێکخستن:
*( He ~ed hard for the presidency but lost.)*

**-campaigner** *(n.)*.

**campanile** (kam´pə-nē′li), *n.* بورجی زەنگ (بەتایبەتی لەتەنیشت کلێسەیەکەوە)؛ بورجی کاتژمێرو زەنگ.

**campanology** (kam´pə-nol′ə-ji), *n.* هونەری زەنگ لێدان؛ هونەری زەنگ دارشتن یا دروستکردن.

**campanula** (kam-pan′yoo-lə), *n.* گوڵە زەنگ؛ گوڵە گەزیزە؛ ڕووەکێکە گوڵی زەنگوڵەیی دەگرێت

**camper** (kam′pēr), *n.* (١) هەوارنشین؛ چادرهەڵدەر
(٢) (ا) ئوتومبیلی " ڤان "
(ب) ترێلەیەکە بە ئوتومبیل ڕادەکێشرێت بۆ هەوارگە بۆ تێدا ژیان.

**campfire** (kamp′fīr´), *n.* (١) ئاگری هەوارگە
(٢) کۆبوونەوە یا ئاهەنگی دەوری ئاگری هەوارگە.

**camp follower,** (١) شوێن کەوتووی ئۆردوو (بۆ ئیشکردن یا بەردەستی کردن). (٢) قەحبەی ئۆردوگا. (٣) ژنە سەرباز یا ئەفسەرێکە کە شوێن مێردەکەی دەکەوێت بۆ هەرشوێنێك بگوێزرێتەوە (٤) شوێن کەوتوو.

**campground** (kamp′ground´), *n.* هەوارگە؛ چادرگا؛ خێوەتگا.

**camphor** (kam′fēr), *n.* کافوور: ماددەیەکە دەکرێتە ناو جل‌وبەرگەوە بۆ پاراستنی لە مۆرانە؛ نەفتالین.

**camphorate** (kam′fēr), *v.t.* کافوور لێدان یا تێکردن.

**camphor ball,** خڕۆکەی کافوورو نەفتالین (کە دەکرێتە جل‌وبەرگی هەڵگیراوەوە بۆ ئەوەی مۆرانە نەیخوات).

**camphor tree,** درەختی کافوور

**camp meeting,** کۆڕێکی ئاینی چەند ڕۆژ خایەنە لە چادرێکدا یا لە دەرەوە

**campo** (kam′pō, käm′pō), *n.* (١) دەشتێکی گژوگیایاوی بە دارو بنچکی تاك‌وتەراوە. (٢) گۆڕەپانێکی بچووکی ناوشار.

**camporee** (kam´pə-rē′), *n.* کۆبوونەوەی دیدەوانی ناوچەیەك.

**campsite** (kamp′sīt´), *n.* هەوارگە؛ چادرگا؛ شوێنی یەك چادر.

**campstool** (kamp′stōōl´), *n.* کورسی‌یەکە دەنووشتێنرێتەوە

**campus** (kam′pəs), *n.* (١) مەیدان: شوێنی کۆبوونەوەی جەماوەری لە ڕۆمای کۆندا (٢) کامپەس: زەمینەو خانووی زانکۆ، دانشگا، یا قوتابخانە؛ دانشگا . *( The University of California has nine ~es.)*

*adj.* تایبەتی بە زانکۆ، دانشگا، یا قوتابخانە؛ تایبەتی بە قوتابیان:
*( ~ activities)*

**can** (kan), *v.i.* (١) زانین (کردنی کارێك). (٢) توانین؛ توانا هەبوون.
(٣) ماف هەبوون (بۆ کردنی شتێك).
(٤) لەوانەبوون. *( C~ it be true?; It ~'t be true.)*
(٥) [Colloq.]، بۆ هەبوون؛ ڕێ پێدران: *( You ~ go now.)*

**can but,** تەنها؛ تەنها ئەوە دەتوانرێت:
*( I can but say that I'll do my best to help.)*

**can** (kan), *n.* (١) قوتوو؛ تەنەکە (٢) پڕ قوتوویەك؛ پڕ تەنەکەیەك.
(٣) [Slang]، بەندیخانە (٤) [Slang]، ئاودەستخانە؛ توالێت
(٥) [Slang]، کەفەل؛ سمت.

*v.t.* (١) کردنە قوتووەوە (خواردەمەنی)؛ کردنە تەنەکەوە.
(٢) [Slang]، تۆمارکردن (لەسەر قەوان).
(٣) [Slang]، لە کار دەرکردن؛ لە ئیش خستن
(٤) [Slang]، بڕینەوە (چەنەبازی). *( C~ the chatter.)*

**can of worms,** مەسەلەیەکی ئاڵۆزو پڕ لە سەرئێشە (کە وا باشترە لێی نزیك نەبیتەوە).

**Canaanite** (kā′nən-īt´), *n. & adj.* کەنعانی؛ کەسێکی کەنعانی.

**Canadian** (kə-nā′di-ən), *adj.* کەنەدی (گەل، کلتوور، زمان)؛ کەنەدایی

*n.* کەنەدی؛ هاونیشتمانی‌یەکی " کەنەدا "

**canal** (kə-nal′), *n.* (١) کەنداو؛ نۆکەند؛ جۆگە؛ کەنداوی هەڵکەنراو؛ لەغەم (٢) بۆڕی (توێکاری، زیندەوەرزانی)؛ لوولە.

*v.t.* لەغەم لێدان؛ جۆگە لێدان؛ کەنداو هەڵکەندن یا دروستکردن.

**canalboat** (kə-nal′bōt´), *n.* بەلەمی بار (بۆ کەنداوو ڕووبار).

**canalize** (kə-nal′īz, kan″l-īz′), *v.t.* (١) جۆگە لێدان؛ لەغەم لێدان؛ کردن بە کەنداو. (٢) کون کردنە لەشەوە یا بۆڕی تێکردن بۆ چۆڕاندنەوەی برین. (٣) ئاراستەکردن بە ڕێگە یا کەنداوێکی تایبەتیدا.
(٤) ڕێگە بۆ کردنەوە؛ بەر بۆ بەرەڵاکردن (هەست).

**-canalization** *(n.)*.

**canape** (kan′ə-pi), *n.* پنتکە نانێکە پەنیر، گۆشت، یا شتی تری دەخرێتە سەرو وەك بەرخۆراك دەخورێت.

**canard** (kə-närd′), *n.* ووت‌ووتی درۆ (بۆ بەهەڵەدابردن)؛ دەنگوباسی درۆ یا هەڵبەستراو (بۆ هەڵخەڵەتاندن).

**canary** (kə-nâr′i), *n.* (١) کەناری: باڵندەیەکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگی دەنگ خۆشە (ئەوەندەی چۆلەکەیەك دەبێت و ماڵی دەکرێت).
(٢) سەمایەکی ئیسپانی بەجۆشە. (٣) شەرابێکی شیرینە.
(٤) ڕەنگی زەرد (وەك هی کەناری).

*adj.* زەرد.

**canary bird,** = **canary.**

**canary grass,** گیایەکە تۆوەکەی دەدرێت بە باڵندە وەك دان.

**canary seed,** تۆوی گیا بۆ دان دەدرێت بە باڵندە.

**canary yellow,** ڕەنگی زەردی کراوە.

**canasta** (kə-nas′tə), *n.* یاری‌یەکی کاغەزە.

**cancan** (kan′kan´), *n.* سەمایەکی ژنانەی بەجۆشی بێ شەرمانەیە.

**cancel** (kan′s'l), *v.t.* (١) کوژاندنەوە؛ سڕینەوە؛ خەت پیاهێنان.
(٢) هەڵوەشاندنەوە: *( to ~ a meeting, contract, etc.)*
(٣) لابردن.
(٤) بەتاڵ کردنەوە (بە مۆر یا نیمزا وەك پوولی پۆستەو چەکی بانق):
*( a ~led postage stamp; to ~ a checl)*
(٥) ( **out** ~ )، هاوتاکردن؛ وەك یەك لێکردن:
*( The pluses and minuses of the case ~ out each other.)*
(٦) پەڕاندن (چاپەمەنی)

*v.i.* ( ~ **out** ), هاوتابوون.

*n.* (١) پەڕاندن (چاپەمەنی، نووسین)؛ لابردن؛ سڕینەوە؛ کوژانەوە.
(٢) (ا) شتی پەڕێنراو یا کوژاوە (ب) جێگری شتی پەڕێنراو یا کوژاوە

**cancellate** (kan′sə-lāt´), *adj.* = **cancellous.**

**cancellation** (kan´s'l-ā′shən), *n.* (١) کوژانەوە؛ سڕینەوە؛ خەت پیاهێنان. (٢) هەڵوەشاندنەوە؛ بەتاڵ کردنەوە.
(٣) شتێکی کوژاوە یا خەت پیاهێنراو؛ شتێکی هەڵوەشاوە.
(٤) مۆر یا نیمزای بەتاڵ کردنەوە (پوولی پۆستە، چەکی بانق... هتد).

**cancellous** (kan′sə-ləs), *adj.* کونیلەدار (ئێسقان)؛ ئیسفەنجی (توێکاری).

**cancer** (kan′sēr), *n.* (١) شێرپەنجە؛ سندان. (٢) دەردێکی کوشندە؛ شتێکی زیانبەخش کە زوو دەتەنێتەوەو شت دەفەوتێنێ.
(٣) [C-]، کۆنەستێرەی قرژاڵ. (٤) [C-]، بورجی قرژاڵ (ئەستێرەوانی)

**cancerous** (kan′sēr-əs), *adj.* (١) شێرپەنجەدار؛ سنداناوی؛ نەخۆشی شێرپەنجەی هەیە: *( ~ cells)* .
(٢) زیانبەخش؛ کوشندە؛ زوو دەتەنێتەوەو شت دەفەوتێنێ.

**cancroid** (kaŋ′kroid), *adj.* (١) شێرپەنجەیی؛ سندانی.
(٢) قرژاڵی؛ وەك قرژاڵ.

*n.* سندانی پێست.

**candelabrum** (kan´d'l-ä′brəm, kan´d'l-ab′rəm), *n.*( *pl.*- **candelabra, candelabrums**), مۆمدانی جوانی لق لق (هەندێك جار مەترونیوێك بەرزە).

**candent** (kan′d'nt), *adj.* بلێسەدار؛ بریقەدار (لە گەرمیدا)؛ گڕگرتوو.

**candescence** (kan-des″ns), *n.* = **incandescence.**

**candescent** (kan-des″nt), *adj.* = **incandescent.**

**candid** (kan′did), *adj.* (١) بێ لایەن. (٢) قسەلەڕوو؛ ڕاستگۆ؛ پاك.
-**candidly** *(adv.)*; **candidness** *(n.)*.
**candidacy** (kan′də-də-si), *n.* ناونران (هەڵبژاردن)؛
پالاوتن (هەڵبژاردن).
**candidate** (kan′də-dāt′, kan′də-dit), *n.* (١) پالێوراو
(هەڵبژاردن): *( The ~ will speak here tomorrow.)*.
(٢) هەڵبژێردراو (بۆ شتێك یا دواڕۆژێکی باش یا خراپ):
*( He is a ~ for ulcer.)*
**candidature** (kan′də-dā′chēr, kan′də-də-chēr), *n.* = **candidacy.**
**candid camera,** کامێرای شاراوە: کامێرایەکی بچووکە لە کاتی سەیردا
بە دزییەوە وێنەی خەڵك دەگرێت هەر بۆ پێکەنین.
**candied** (kan′did), *adj.* (١) بە شەکر کراو؛ شەکراوی.
(٢) گەڕاوە (بۆ شەکر). (٣) شیرین و خۆش.
**candle** (kan′d'l), *n.* (١) مۆم؛ مۆمی سووتاندن.
(٢) شتێکی وەك مۆم.
(٣) یەکەی پێوانی ڕووناکی.
*v.t.* هێلکە تاقیکردنەوە لەبەر ڕووناکی مۆمدا (بۆ پاك و پیسی).
**( a game ) not worth the candle,** شایستەی کردن نییە؛ ناهێنێت.
**burn the candle at both ends,** زۆر کارکردن یا ڕابواردن و ووزە پێ
نەمان؛ لە بەیانی زووەوە هەتا شەو ئیشکردن یا ڕابواردن.
**can't ( or is not fit to ) hold a candle to,** ئەوی تر زۆر باشترە؛
بەراوورد ناکرێ لەگەڵ ئەوی تردا.
**candleholder** (kan′d'l-hōl′dēr), *n.* = **candlestick.**
**candlelight** (kan′d'l-līt′), *n.* (١) ڕووناکی مۆم.
(٢) کاتی مۆم داگیرسان؛ ئێوارە.
**candle power,** (١) هێزی ڕووناکی مۆم.
(٢) هێزی ڕووناکی بە هێزی ڕووناکی مۆم پێوراو.
**candlestick** (kan′d'l-stik′), *n.* مۆمدان.
**candlewick** (kan′d'l-wik′), *n.* پلیتەی مۆم.
**candlewood** (kan′d'l-wood′), *n.* درەخت مۆم: (ا) درەختێکی
دڕکاوییە گوڵی ڕەنگاوڕەنگی هێشوویی دەگرێت. (ب) داری جەویداری ئەم
درەختە و درەختی تر کە بۆ چیلکە و ئاگرەخۆشە بەکاردەهێنرێ چونکە
ڕووناکی زۆر دەداتەوە.
**candor** (kan′dēr), *n.* (١) بێ لایەنی. (٢) قسەلەڕوویی؛ ڕاستگۆیی.
(٣) [Obs.]، پاکی. (٤) [Obs.]، بە بەزەییتی؛ دڵنەرمی.
**candour** (kan′dēr), *n.* = **candor.**
**candy** (kan′di), *n.* نوقوڵ؛ شیرینی.
*v.t.* (١) پاراستن بە کوڵاندن بە شەکرەوە. (٢) کردن بە شەکر؛ کردن بە بلوور.
(٣) شەکر پێوەکردن. (٤) شیرین کردن؛ خۆش کردن.
*v.i.* بوون بە شەکر؛ گەڕانەوە؛ وەك بلوور لێهاتن.
**cane** (kān), *n.* (١) قامیش؛ قەڕەم. (٢) قامیشی شەکر.
(٣) ڕووەکی قامیشدار. (٤) داردەست؛ گۆچان؛ دارحەیزەران.
(٥) داری فەلاقە (٦) شووڵ یا داری جیڕ (بۆ کورسی و زەمیلە و سەبەتە
درووستکردن).
*v.t.* (١) فەلاقەکردن بە دار؛ بە دار لێدان.
(٢) بە شووڵ درووستکردن (کورسی، سەبەتە)؛ چاك کردن بە شووڵ.
**canebrake** (kān′brāk′), *n.* بێشەڵانی قامیش و قەڕەم.
**canescent** (kə-nes′'nt), *adj.* بە گەندەمووی سپی داپۆشراو؛
سپی بوو.
**cane sugar,** شەکری قامیشی شەکر.
**cangue** (kaŋ), *n.* تەوقێکی تەختەیە دەکرایە مل و دەستی تاوانباران
لە چین بۆ سزادان.
**canine** (kā′nīn), *adj.* (١) سەگ؛ تایبەتی بە سەگ؛ وەك سەگ.
(٢) توخمی سەگ (کە سەگ و گورگ و چەقەڵ و ڕێوی دەگرێتەوە).
(٣) کەلبەیی.
*n.* (١) سەگ. (٢) کەلبە.
**canine tooth,** کەلبە.
**canister** (kan′is-tēr), *n.* (١) قوتوو (قاوە، چا، توتن).
(٢) گوللەتۆپ؛ ساچمە؛ گوللە. (٣) قوتووی کڵاوی گاز (کە ماددەی کیمیایی
تێدایە و گاز و هەوای پیس پاك دەکاتەوە پێش هەڵمژینی).
**canister shot,** گوللەتۆپ؛ ساچمە؛ گوللە.
**canker** (kaŋ′kēr), *n.* (١) خۆرە (بەتایبەتی هی ناودەم).
(٢) کرمی سندان. (٣) سندانی ڕووەك.
(٤) شتێك یا نەخۆشییەك کە دەبێتە هۆی داڕزاندن و فەوتاندن.
*v.t.* (١) خۆرە لێدان؛ سندان لێدان؛ کرمێ کردن.
(٢) ڕزاندن؛ فەوتاندن؛ پیس و بۆگەن کردن (بیروباوەڕ، مێشك، هەڵوێست،
دەستگای گەل و وڵات... هتد).
*v.i.* سندان لێدان؛ ڕزان؛ فەوتان؛ پیس و بۆگەن بوون؛ کرمێ بوون؛ تێکچوون.
**cankerous** (kaŋ′kēr-əs), *adj.* (١) خۆرەدار؛ سنداناوی؛ کرمێ.
(٢) سندان لێدەر؛ دەبێتە هۆی سندان یا خۆرە.
(٣) فەوتێنەر؛ داڕزێنەر؛ خراپکەر؛ تێکدەر؛ پیس و بۆگەنکەر.
**cankerworm** (kaŋ′kēr-wũrm′), *n.* کرمی سندان.
**canna** (kan′ə), *n.* (١) ڕووەکێکی ناوچە گەرمەکانە لە توخمی دارمۆز
گەڵای پان و ڕەگی ئەستوور و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێت
(٢) گوڵی ئەم ڕووەکە.
**cannabin** (kan′ə-bin), *n.* قەنەبین: ماددەیەکە وەك جەوی لە گیای
بەنگ دەردەهێنرێ و سەرخۆشکەرە؛ بەنگ.
**cannabis** (kan′ə-bis), *n.* بەنگ؛ حەشیشە.
**canned** (kand), *adj.* (١) هی قوتوو؛ کراوەتە قوتووەوە (خواردەمەنی):
*( ~ food, fruit, vegetables)*
(٢) [Colloq.]، دەرکراو (لە کار یا پلەی فەرمانڕەوایی).
(٣) [Colloq.]، تۆمارکراو (مۆسیقا، پێکەنینی سەر تەلەفزیۆن):
*( ~ music; So if television is to have ~ laughter, how about ~ tears?)*
**canned coal,** خەڵووزی بڵێسەدار: خەڵووزێکە بە ئاسانی گڕ دەگرێت.
**canner** (kan′ēr), *n.* کەسێکە خواردەمەنی دەکاتە ناو قوتوو یا تەنەکەوە
بۆ پاراستن و هەڵگرتنی.
**cannery** (kan′ēr-i), *n.* کارگەی خواردەمەنی کردنە ناو قوتوو یا
تەنەکەوە.
**cannibal** (kan′ə-b'l), *n.* (١) پیاوخۆر؛ کەسێکە گۆشتی ئادەمیزاد
دەخوات. (٢) خۆخۆر؛ گیاندارێکە لە توخمی خۆی دەخوات.
*adj.* خۆخۆر؛ گۆشتی توخمی خۆخۆر؛ دڕندە.
**cannibalism** (kan′ə-b'l-iz'm), *n.* خۆخۆری؛ پیاوخۆری؛
دڕندەیی.
-cannibalistic *(adj.)*; **cannibalistically** *(adv.)*.
**cannibalize** (kan′ə-b'l-īz′), *v.t.* (١) هەڵوەشاندنەوەی تۆپ و
فڕۆکە و کەرەسەی جەنگی شکاوی تر و مەکینەی شکاو و لێکردنەوەی پارچە
ساغەکانی. (٢) بێ بەش کردنی لایەك یا دەستگایەك لەبەر خاتری لایەکی تر.
*v.i.* (١) خۆ خواردن؛ ئادەمیزاد خواردن؛ گۆشتی توخمی خۆ خواردن.
(٢) بێ بەش کردنی لایەك یا دەستگایەك لەبەر خاتری لایەکی تر
**cannikin** (kan′ə-kin), *n.* (١) قوتووی بچووك؛ کووپ.
(٢) سەتڵی دارین.
**cannon** (kan′ən), *n.* (١) تۆپ (جەنگ).
(٢) لغاو (هەروەها پێی دەوترێ: " **cannon bit** ").
(٣) ئەڵقەی زەنگ (کە پێی هەڵدەواسرێت). (٤) ئێسقانی لوولاقی ئەسپ و
وڵاخی کاوێژکەر (هەروەها پێی دەوترێ: " **cannon bone** ")
(٥) بۆرییەکە کە بۆرییەکی تری لەناودا دەخولێتەوە بێ ئەوەی بەر یەکتری
بکەون (مەکینەکاری).
*v.t.* تۆپ پێوەنان؛ دانە بەر تۆپ؛ تۆپ تێ تەقاندن.

*v.i.* تۆپ تەقاندن؛ تۆپ ئاگردان.

**cannonade** (kan′ən-ād′), *n.* (١) تۆپ تەقاندن یەك لەدوای یەك؛ بۆمباران (٢) تۆپ پێوەنان؛ دانە بەر تۆپ.

*v.t.* تۆپ تێ تەقاندن لە پەستادا؛ تۆپ پێوەنان

*v.i.* پەستا پەستا تۆپ تەقاندن.

**cannon ball,** گوللە تۆپ

**cannon bit,** لغاو

**cannon bone,** ئێسقانی لوولاقی ئەسپ و وولاخی کاوێژکەر.

**cannoneer** (kan′ən-êr′), *n.* تۆپچی؛ تۆپ تەقێنەر.

**cannon fodder,** خۆراکی جەنگ: سەربازو ئەفسەرو هەموو ئەوانەی لە جەنگدا دەکوژرێن

**cannonry** (kan′ən-ri), *n.* (١) تۆپ.
(٢) ئاگری تۆپ؛ تۆپ باران؛ گوللەباران کردن بە تۆپ

**cannon shot,** (١) تەقەی تۆپ. (٢) گوللە تۆپ.
(٣) مەودای گوللە تۆپ.

**cannot** (kan′ot, ka-not′, kan′ət), = **can not.**

**cannot but,** چار نییە؛ پێویستە:

*( I cannot but help them.)*

**cannula** (kan′yoo-lə), *n.* کانیولا: دەرزییەك یا بۆرییەکی باریکە بۆ برین چۆڕاندنەوە یا دەرمان کردنە ناو لەشەوە.

**cannular** (kan′yoo-lēr), *adj.* = **tubular.**

**cannulate** (kan′yoo-lit, kan′yoo-lāt′), *v.t.* دەرزی یا بۆری باریك کردن بە لەشدا بۆ برین چۆڕاندنەوە یا دەرمان کردنە ناو لەشەوە.

*adj.* وەك بۆری

**canny** (kan′i), *adj.* (١) کارامە؛ بزان؛ شارەزا؛ لێهاتوو.
(٢) زۆرزان؛ چاکەی خۆ زان. (٣) دووربین؛ ژیر. (٤) ووریا؛ ئاگادار.
(٥) گیر؛ ڕەزیل. (٦) مرۆڤ نەتوانێت ئیِنی تێ بکات.
(٧) (ا) جوان؛ دڵگیر (ب) خۆش

**canoe** (kə-nōō′), *n.* بەلەمی سەوڵ؛ بەلەمێکی باریکەلەی درێژکۆلەی بچووکی سەوڵە

*v.i.* (١) سەوڵ لێدان؛ بەلەمی بچووکی سەوڵ لێخوڕین.
(٢) بە بەلەمی سەوڵ ڕۆیشتن.

*v.t.* بە بەلەمی سەوڵ گواستنەوە.

**canoeist** (kə-nōō′ist), *n.* سەوڵ لێدەر؛ بەلەمی بچووکی سەوڵ لێخوڕ.

**canon** (kan′ən), *n.* (١) یاسای ئایینی. (٢) یاسا.
(٣) پێوانە؛ کێشانە؛ سەنگی مەحەك.
(٤) ئینجیل: ئەو بەشانەی ئینجیل کە کڵێسە بە ڕاستی داناون.
(٥) لیستەی ناوی پیرو پیاوچاکانی کڵێسەی کاسۆلیکی.
(٦) لیستە؛ کەتەلۆگ.
(٧) بۆ سەندنەوە (مۆسیقا)؛ پیاچوونەوە؛ دووبارەکردنەوە.
(٨) جۆرە تیپێکی گەورەیە (چاپەمەنی).
(٩) لیستەی بڕواپێکراوی بەرهەمی نووسەرێك.

**canonical** (kə-non′i-k'l), *adj.* (١) بەپێی یاسا یا پەیڕەوی کڵێسە. (٢) بڕواپێکراو؛ پەسەندکراو. (٣) بەشێکە لە ئینجیلی پەسەندکراو.

**canonical hour,** کاتی نوێژو پاڕانەوەی خاچ پەرستان (ڕۆژی حەوت جارە).

**canonicals** (kə-non′i-k'lz), *n.pl.* بەرگی قەشە لە کاتی بەر لە نوێژکردندا

**canonicity** (kan′ən-is′ə-ti), *n.* (١) شایستەی بوون بە بەشێك لە ئینجیلی پەسەندکراودا. (٢) ڕاستەقینەیی (بەپێی یاسای کڵێسە).
(٣) گونجان لەگەڵ یاسای کڵێسەدا.

**canonist** (kan′ən-ist), *n.* (١) زانای یاسایی کڵێسە؛ یاساناسی کڵێسە. (٢) مۆسیقازان.

**canonize** (kan′ən-īz′), *v.t.* (١) خستنە ناو ڕیزی پیرانەوە (پیاو- چاکێکی مردوو)؛ کردن بە وەلی؛ پیرۆزکردن (مردوو):

*( He was ~d by the Pope.)*

(٢) پەرستن؛ شکۆپێدان.
(٣) کردن بە بەشێك لە یاسا و پەیڕەوی کڵێسە.
(٤) پەسەندکردن لەلایەن کڵێسەوە.

-canonization *(n.)*.

**canon law,** (١) یاسا و پەیڕەوی کڵێسە.
(٢) یاسا و پەیڕەوی کڵێسەی کاسۆلیکی.

**canopic jar ( or vase or urn ),** کووپەیەکە میسرییە کۆنەکان ڕیخۆڵەی مردووی مۆمیاکراویان تێدا هەڵدەگرت و دەیان ناشت.

**canopy** (kan′ə-pi), *n.* (١) پەردەکوللە؛ کوللە؛ پەردەی سەر شتێکی پیرۆز. (٢) (ا) کەپر؛ سابات؛ چەرداخ. (ب) چەتری سەر دەرگاو پەنجەرە؛ چەتری لەژێردا دانیشتن. (ج) چەتری سەربان (دارودرەخت): *( a ~ of trees)*.
(٣) ئاسمان؛ بنمیچ: *( the ~ of the sky)*.
(٤) (ا) شووشەی تەوقەسەری کورسی فڕۆکەوان کە وەك دەرگا دەکرێتەوەو دادەخرێت. (ب) چەتری پەڕەشووت.

*v.t.* داپۆشین؛ چەتر یا پەردەکوللە بەسەرداگرتن؛ سەرگرتن:

*( Mist ~ied the landscape.)*

**canorous** (kə-nôr′əs, kə-nō′rəs), *adj.* خۆش (ئاواز، گۆرانی، دەنگ)؛ خۆش نەوا.

**canst** (kanst; *unstressed* kənst), *archaic second person singular, present indicative of* **can.**

**cant** (kant), *n.* (١) کڕووزانەوەو پاڕانەوەی سواڵکەر.
(٢) زمانی تایبەتی هەندێك تاقمی وەك دزو سواڵکەر... هتد.
(٣) زمانی تایبەتی بە پیشەیەك.
(٤) قسەی بێ بایەخ؛ دەمەتەقێ؛ قسەی پەڕپووت. (٥) دووزمانی؛ دووڕوویی.

*v.i.* (١) کڕووزانەوە (سواڵکەر)؛ پاڕانەوە.
(٢) بە زمانێك قسەکردن کە کەس تێی نەگات.
(٣) دووزمانی کردن؛ دووڕوویی کردن.

*adj.* (١) تایبەتی بە زمانی پیشەیەك یا تاقمێك و کەسی تر تێی ناگات.
(٢) کلێشە؛ پەڕپووت (زمان)؛ بێ تام (زمان). (٣) دووزمانی؛ دووڕوویی.

**cant** (kant), *n.* (١) گۆشەی دەرەوە (خانوو).
(٢) لێژی؛ ڕوویەکی لێژ. (٣) جووڵەیەکی لەپڕ کە شتێك هەڵدەگەڕێنێتەوە یا دەیخات؛ تەکان؛ تاسە. (٤) کەوتن؛ هەڵگەڕانەوە؛ لاربوونەوە؛ وەرگەڕان.

*v.t.* (١) لێژکردن؛ لێژکردنەوە. (٢) هەڵگەڕاندنەوە؛ وەرگەڕاندن.
(٣) دان بە زەویدا؛ فڕێدانە سەر زەوی؛ خستن بە لادا.

*v.i.* (١) کەوتن بە لادا؛ خواربوونەوە؛ لاربوونەوە.
(٢) پێچکردنەوە (کەشتی). (٣) لێژبوونەوە.

*adj.* (١) گۆشە خوار؛ سووچ لار. (٢) لێژ؛ خوار.

**can't** (kant, känt), = **cannot.,** نەتوانین؛ ناتوانرێ؛ ناتوانێ.

**cantabile** (kän-tä′bi-lā′), *adj. & adv.* لەسەرخۆو خۆش نەوا (ئاواز)؛ لە گۆرانی دەچێت.

*n.* ئاوازێکی لەسەرخۆو خۆش نەوا؛ مۆسیقایەکی لە گۆرانی چوو.

**cantalever, cantaliver** (kan′t'l-ev′ēr, kan′t'l-ē′vēr), *n.* = **cantilever.**

**cantaloupe, cantaloup** (kan′tə-lōp′), *n.* کالەکە زەردە: جۆرە کاڵەکێکی توێکڵ زەردی شەمامەیی شیرینە.

**cantankerous** (kan-taŋ′kēr-əs), *adj.* تووڕەوتیژ؛ شەڕانی؛ تەنگەجیکڵانە؛ حەزکەر لە ئاژاوە نانەوە.

**cantata** (kən-tä′tə, kan-tä′tə), *n.* چیرۆکێکە بە گۆرانی و مۆسیقاوە دەووترێت بەبێ خۆنوواندن.

**cantatrice** (kän′tä-trē′che), *n.* ئافرەتی گۆرانی بێژ.

**canteen** (kan-tēn′), *n.* (١) دووکانی ئۆردووگا؛ فرۆشگای بچووکی ئۆردووگا؛ حانووت. (٢) یانەی سەرباز (لەناو شاردا نزیك بە ئۆردووگا).
(٣) یانەی لاوان. (٤) مەتارە. (٥) کەرەسەی چێشت لێنانی سەربازێك.

**canter** (kan′tēr), *n.* نەرمە غار؛ نەرمە لۆقە.

***v.i. & v.t.*** نەرمە غار کردن

**cant hook,** تەلێکی ئاسنە مووروەداری زلی پێ هەڵدەگێڕرێتەوە.

**canthus** (kan′thəs), ***n.*** ( *pl.* **canthi** ). قنچکی چاو؛ قوژبنی چاو.

**canticle** (kan′ti-k'l), ***n.*** (١) سروود؛ گۆرانی. (٢) سروودی ئاینی.

**cantilever** (kan′t'l-ev′ēr, kan′t'l-ē′vēr), ***n.*** نیرگە یا سەربانێکە سەرێکی لەسەر دیوارێك بەندەو سەرەکەی تریشی لەسەر هیچ، واتە بە هەواوە هەڵواسراوە.

**cantilever bridge,** پردی هەڵواسراو.

**cantina** (kan-tē′nə), ***n.*** مەیخانە؛ یانەی مەی؛ کانتین.

**cantle** (kan′t'l), ***n.*** (١) قاش؛ پارچە. (٢) قەڵیووزی دواوەی زین.

**canto** (kan′tō), ***n.*** (١) بەند یا بەشێکی هۆنراوەیەکی درێژ. (٢) [Obs.]: بەستە؛ گۆرانی.

**canton** (kan′tən, kan-ton′), ***n.*** (١) هەرێم (بەتایبەتی لە سویسرا)؛ ناوچە؛ کانتۆن (٢) پارچەیەکی چوارگۆشەیی کونجی سەرووی ڕاستی ئاڵا، درووشم، یا قەڵغانێکە

***v.t.*** (١) کردن بە ناوچە ناوچەوە؛ بەشکردن بە هەرێمەوە. (٢) حەواندنەوە (لەشکر)؛ دابەشکردنی ئۆردوو بەسەر ماڵاندا بۆ حەوانەوە.

**cantonment** (kan-ton′mənt, kan′tən-mənt, kan-tōn′mənt), ***n.*** (١) حەواندنەوەی ئۆردوو لە ماڵاندا. (٢) ئەو ماڵانەی ئۆردوو تێیدا دەحەوێنرێتەوە. (٣) ئۆردووگا؛ سنگەی سوپا.

**cantor** (kan′tēr, kan′tôr), ***n.*** (١) سەرەدەستەی سروودخوێنەری کڵێسە. (٢) سروودخوێنەری کەنیشتە؛ تەورات خوێنەری کەنیشتە بە دەنگی بەرز.

**cantus** (kan′təs), ***n.*** (١) گۆرانی؛ ئاواز. (٢) مۆسیقای ئاینی (خاچ پەرستی).

**canty** (kän′ti), ***adj.*** [Scot. & British Dial.]. خۆش و بەجۆش؛ دڵکەرەوە؛ بە کەیف

**canvas** (kan′vəs), ***n.*** (١) قوماشی گونیەو چادرو بایەوان... هتد؛ جانفاس (٢) بایەوان. (٣) (ا) قوماشی وێنەکێشی؛ قوماشی تابلۆ. (ب) وێنە؛ تابلۆ؛ نیگار. (٤) چادری سێرك؛ چادر.

***adj.*** لە قوماشی زبرو ئەستوور دروستکراو (وەك قوماشی چادرو گونیەو بایەوان)

**under canvas,** (١) لەژێر چادردا (ئۆردوو، سێرك). (٢) بایەوانەکانی کراونەتەوە. (٣) بە بایەوان دەڕوات بەڕێوە.

**canvass** (kan′vəs), ***v.t.*** (١) باش لێکۆڵینەوە؛ بە وورد و درێژی باسکردن؛ لێ وورد بوونەوە. (٢) (ا) گەڕان بە ناوچەیەکدا ماڵ بە ماڵ و دووکان بە دووکان و داوای دەنگ بۆ دان کردن، شت پێ فرۆشتن یا بەشداری کردن لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا ( *We ~ed the whole town before the election.* ) (ب) ڕاوەرگرتنی گشتی.

***n.*** (١) لێکۆڵینەوە بە ووردی؛ بە وورد و درێژی باسکردن؛ لێ وورد بوونەوە. (٢) (ا) گەڕان بە گەڕەکێکداو داوای دەنگ بۆ دان کردن، شت پێ فرۆشتن، یا بەشداری کردن لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا (ب) ڕاوەرگرتنی گشتی.

**canyon** (kan′yən), ***n.*** دۆڵ؛ شیو؛ چەم.

**canzonet** (kan′zə-net′), ***n.*** گۆرانییەکی کورت و خۆش و بەجۆش.

**cap** (kap), ***n.*** (١) کڵاو؛ تەپلە؛ شەپقە. (٢) کڵاوێکە نیشانەی پیشە، پلەوپایە، یا پلەی خوێندەوارییە: ( *a cardinal's ~* ) (٣) کڵاوە، قەباغ، سەر (شووشە، قاپ، قوتوو، تەنەکە... هتد)؛ سەرقاپ: ( *a knee ~ ; a bottle ~* ) (٤) کەپسولەی بارووت (چەکی ئاگرین). (٥) کەپسولەی کاغەزی چەکی یاری. (٦) تەبەقە کاغەزی درێژ.

***v.t.*** (١) (ا) کڵاو کردنە سەر. (ب) سەرنانەوە (شووشە، قوتوو، دەف)؛ قەباغ نانەوە؛ سەر قایم کردن؛ سەر داخستن؛ سەرگرتن؛ قەپات کردن. (٢) داپۆشین؛ گرتنەوە: ( *Snow ~ped the hills.* ).

(٣) هاوتایی کردن؛ باشتربوون لە.

**a feather in one's cap,** مایەی شانازی؛ دەسکەوتێك یا کارێك کە جێی شانازی بێت بۆ کەسێك.

**cap in hand,** بە ملکەچی؛ سەرشۆڕانە.

**cap the climax,** لە بەرزترین ئەنجامیش تێپەڕبوون؛ لەوپەڕی سنوور تێپەڕبوون.

**set one's cap for,** [Colloq.], خۆ بۆ نانەوە بۆ دڵ ڕاکێشانی پیاوێك لەلایەن ئافرەتێکەوە بۆ خواستنی یا بوون بە دڵداری؛ بەتەمابوون؛ تەڵە بۆ نانەوە.

**capability** (kā′pə-bil′ə-ti), ***n.*** (١) توانا؛ لێهاتوویی؛ لە باردا بوون؛ ووزە (مێشك یا لەش). (٢) توانای پەرەسەندن بوون؛ بۆ بەکارهێنان یا چاکتربوون شیان. (٣) (*pl.*)، توانا و ووزەی شاراوە یا هێشتا بەکارنەهێنراو.

**capable** (kā′pə-b'l), ***adj.*** (١) بە توانا؛ لێهاتوو؛ بەکار؛ دەستباڵا. (٢) [Archaic]، فراوان؛ گەورە (شوێن).

**capable of,** (١) لە دەست هاتن؛ لە باردا بوون؛ لە توانادا بوون؛ لێ وەشاندنەوە: ( *He is quite capable of neglecting his duty.* ) (٢) بۆهەبوون؛ لەوانەبوون: ( *The situation is capable of improvement.* )

**capacious** (kə-pā′shəs), ***adj.*** فراوان؛ گەورە (شوێن)؛ زۆر دەگرێت.

**capacitate** (kə-pas′ə-tāt′), ***v.t.*** (١) ئامادەکردن؛ توانا پێدان؛ شیاندن. (٢) ماف پێدان؛ ڕێگە پێدان؛ شیاندن: ( *~d to vote* ).

**capacitor** (kə-pas′ə-tēr), ***n.*** کۆکەرەوەی تەووژمی کارەبا (مەکینەی ئۆتۆمبیل).

**capacity** (kə-pas′ə-ti), ***n.*** (١) گرتن؛ جێ تێدا بوونەوە؛ فراوانی. (٢) پڕ؛ ئەوەندەی کە شوێنێك بیگرێت: ( *The theater was filled to ~.* ) (٣) توانای فێربوون؛ توانای مێشك. (٤) توانای کردن؛ توانا. (٥) شیان. (٦) پلە؛ وەك؛ لەو پلەوپایەداو بەو دەسەڵاتەوە: ( *He acts in the ~ of advisor.* )

**cap and gown,** تەپلەو عەبا: بەرگی ئاهەنگی دەرچوونە لە زانکۆو قوتابخانە.

**cap-a-pie** (kap′ə-pē′), ***adv.*** سەرتاپا؛ لە تەوقی سەرەوە تا کەلەموستی پێ: ( *He was armed ~.* ).

**caparison** (kə-par′ə-s'n), ***n.*** (١) ڕەخت و شەقەبەند؛ سەرزین؛ سەرزینی ڕازاوە. (٢) جل و بەرگی جوان؛ پۆشاك.

***v.t.*** (١) سەرزینی جوان دان بەسەر ئەسپدا. (٢) جلی جوان لەبەرکردن؛ ڕازاندنەوە بە بەرگی جوان.

**cape** (kāp), ***n.*** سەرجل؛ پاڵتۆیەکی بێ قۆڵی ئەختێك دەڵبی ژنانەو پیاوانەیە دەدرێت بەسەر شاندا.

**cape** (kāp), ***n.*** نووك یا سەرلووتکەی زەوی درێژبووەوە بۆ ناو دەریا.

**cape** (kāp), ***n.*** = capeskin.

**caper** (kā′pēr), ***v.i.*** جووتە لێدان بە ئاسمانداو یاری کردن لە خۆشیدا (وەك کارو بەرخ و گوێرەکەو جوانووی تێن).

***n.*** (١) جووتە لێدان بە ئاسمانداو یاری کردن لە خۆشیدا (وەك کارو بەرخ و جوانوو). (٢) کردەوەیەکی گاڵتەوگەپی شێتانەو سەیر.

**cut a caper ( or capers ),** (١) یاری و سەماکردن لە خۆشیدا؛ جووتە لێدان بە ئاسمانداو یاری کردن لە خۆشیدا (کار، بەرخ... هتد). (٢) شتی شێتانەو سەیر سەیر کردن؛ گاڵتەوگەپ کردن.

**caper** (kā′pēr), ***n.*** (١) بنچکێکی درکاوییە. (٢) (*pl.*)، خونچە سەوزەکەی ئەم ڕووەکە کە ئەوەندەی دەنکە نۆکێك دەبێت و دەکرێت بە ترشیات و لە چێشت لێناندا بەکاردێت.

**capercaillie** (kap′ēr-kāl′yi), ***n.*** باڵندەیەکی ئەورووپاییە ئەختێك لە مریشك گەورەترە.

**capeskin** (kāp′skin′), ***n.*** چەرمی بزن (دەکرێت بە دەستکێش)

**capias** (kā'pi-əs, kap'i-əs), ***n.*** فەرمانی دادگایی بە گرتنی کەسێك.
**capillaceous** (kap ˊl-ā'shəs), ***adj.*** وەك موو؛ دەزوویی؛ زۆر بارێك.
**capillarity** (kap ˊl-ar'ə-ti), ***n.*** کارلێکردن بە ڕاکێشان یا
پاڵ پێوەنان.
**capillary** (kap''l-er ˊi), ***adj.*** (١) تاڵەمووی؛ دەزوولەیی؛ زۆر بارێك.
(٢) تایبەتی بە دەزوولەی خوێن.
***n.*** (١) بۆری دەزوولەیی؛ بۆری تاڵەمووی (هەروەها پێی دەوترێ:
" capillary tube " ). (٢) دەزوولەی خوێن.
**capillary attraction ( or repulsion ),** ڕاکێشان یا
پاڵ پێوەنانی شلە بە بۆری دەزوولەییدا.
**capillary tube,** بۆری دەزوولەیی.
**capital** (kap'ə-t'l), ***adj.*** (١) (ا) سزاکەی کوشتنە:
***( a ~ offence, crime, etc.)***
(ب) هەرە گەورە (سزا)؛ هەڵواسین دەگرێتەوە: ***( ~ punishment)*** .
(٢) سەرەکی؛ بنچینەیی؛ زۆر گرنگ؛ یەکەم.
(٣) پایتەخت: ***( a ~ city)*** . (٤) سەرمایەداری.
(٥) نایاب؛ یەکەم؛ زۆرباش.
(٦) گەورە (تیپ): ***( ~ letters)*** .
***n.*** (١) تیپی گەورە (وەك: " G " لە ووشەی " God " ، " K " لە ووشەی
" Kurdistan " دا). (٢) پایتەخت؛ شانشین.
(٣) سەرمایە؛ سامان: ***( The project requires a great deal of ~ .)*** .
(٤) سامان؛ سەرمایە: ***( Energy and education are his only ~ .)*** .
(٥) [C-]. سەرمایەداران؛ چینی سەرمایەدار.
**make a capital of,** بۆ سوودی خۆ بەکارهێنان؛ سوود لێ وەرگرتن؛
بەکەڵك هێنان.
**capital** (kap'ə-t'l), ***n.*** تەوقەسەری ڕازاوەی کۆڵەکەو پایە.
**capital account,** ڕاپۆرتی دارایی وەرزیی دەستگایەکی پیشەسازی
یا بازرگانی
**capital gains,** قازانجی دەسکەوتوو لە فرۆشتنی زەوی‌وزارو خانوو و
بۆرسەوە
**capital goods,** کەرەسەی پارە پەیداکەر؛ شتومەکی بەرهەمدار (خانوو،
کەرەسەی خاو، مەکینە).
**capitalism** (kap'ə-t'l-iz'm), ***n.*** (١) سەرمایەداری: ڕێباز یا
ڕژێمێکی ئابوورییە بریتییە لە شت هێنانە بەرهەم بۆ قازانجی خۆ.
(٢) ڕژێمی سەرمایەداری.
**capitalist** (kap'ə-t'l-ist), ***n.*** (١) سەرمایەدار: خاوەنی دەستگای
پیشەسازی و بازرگانی. (٢) لایەنگری ڕژێمی سەرمایەداری.
(٣) دەوڵەمەند؛ کەسێکی ساماندار.
**capitalistic** (kap ˊə-t'l-is'tik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە سەرمایەداری و
سەرمایەداران؛ تایبەتی بە ڕژێمی سەرمایەداری.
(٢) لایەنگری ڕژێمی سەرمایەداری.
**-capitalistically** ***(adv.).***
**capitalize** (kap'ə-t'l-īz ˊ), ***v.t.*** (١) کردن بە سەرمایە؛ گۆڕینەوە بە
پارە. (٢) ( ~ on ): بەکارهێنان بۆ سوودی خۆ؛ بەکەڵك هێنان:
***( He ~d on his family name.)***
(٣) دامەزراندنی دەستگایەکی بازرگانی بە سەرمایەی خۆ؛ پارە دانان بۆ
دامەزراندنی دەستگایەکی بازرگانی.
(٤) بە تیپی گەورە نووسین (ووشە، ڕستە).
(٥) دەستپێکردنی ووشە بە تیپی گەورە:
***( to ~ a word, proper nouns, etc.)***
**-capitalization** ***(n.).***
**capital letter,** تیپی گەورە (وەك: **A, B, F, M** ).
**capital levy,** باجی سەرمایە.
**capitally** (kap'ə-t'l-i), ***adv.*** بە نایابی؛ زۆر بە باشی.
**capital punishment,** لەسێدارەدان؛ هەڵواسین؛ سزای گەورە.

**capital ship,** کەشتی جەنگیی سەرەکی
**capital stock,** (١) سەرمایەی کۆمپانیایەکی هاوبەش (کە هەر بەشەی
هی کەسێکە). (٢) نرخی سەرجەمی ئەم بەشانە.
**capitate** (kap'ə-tāt ˊ), ***adj.*** (١) سەر خڕو گەورە (نێسقان،
شاخی هەستداری گیانداری بێ بڕبڕە). (٢) لە سەر دەچێت (وەك هەندێ گوڵ).
**capitation** (kap ˊə-tā'shən), ***n.*** (١) سەرژماردن؛ سەرژمێری.
(٢) سەرانە.
**Capitol** (kap'ə-t'l), ***n.*** (١) پەرستگای " جوپیتەر " لە ڕۆما.
(٢) گردی " کاپیتۆلاین " لە ڕۆما کە ئەم پەرستگایەی لەسەرە.
(٣) کاپیتۆل: بارەگای کۆنگرێسی ئەمەریکی لە واشنتۆن؛ کۆشکی کۆنگرێس.
(٤) [c-]، بارەگای پەرلەمانی هەرێمەکە لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا.
**Capitoline** (kap'ə-t'l-īn ˊ), ***n.*** کاپیتۆلاین: یەکێکە لە حەوت
گردەکەی ڕۆمای کۆن.
***adj.*** (١) تایبەتی بەم گردە. (٢) تایبەتی بە پەرستگای " جوپیتەر " کە لەسەر
ئەم گردە درووستکراوە
**capitular** (kə-pich'ə-lēr), ***adj.*** تایبەتی بە لقی کۆمەڵێکی ئاینی.
***n.*** (١) ئەندامی لقێکی وەها.
(٢) کۆمەڵێك یاسا و پەیڕەوی کڵێسە؛ کۆمەڵێك یاسا و پەیڕەو.
**capitulary** (kə-pich'ə-ler ˊi), ***adj.*** = capitular.
***n.*** (١) ئەندامی لقی کۆمەڵێکی ئاینی.
(٢) کۆمەڵێك یاسا و پەیڕەوی کڵێسە؛ کۆمەڵێك یاسا و پەیڕەو.
**capitulate** (kə-pich'ə-lāt ˊ), ***v.i.*** (١) خۆبەدەستەوەدان بە مەرج؛
چەك فڕێدان بە مەرج؛ خۆبەدەستەوەدان. (٢) وازهێنان؛ دەست هەڵگرتن؛
بەرهەڵستی نەکردن.
**capitulation** (kə-pich ˊə-lā'shən), ***n.*** (١) کورتەی باس.
(٢) خۆبەدەستەوەدان بە مەرج؛ چەك فڕێدان؛ وازهێنان.
(٣) بەیاننامەی خۆبەدەستەوەدان بە مەرج؛ پەیمانی خۆبەدەستەوەدان.
**capitulum** (kə-pich'ə-ləm), ***n.*** (١) (ا) سەرە ئێسقان (کە جومگە
پێکدێنێت)؛ گرێی سەرە ئێسقان. (ب) سەرە خڕەکەی شاخی هەستیاری
هەندێك جانەوەر. (٢) گوڵی هێشوویی (وەك هی گوڵە مێخەك).
**capon** (kā'pon, kā'pən), ***n.*** کەڵەشێری خەساوی دابەستە.
**caporal** (kap'ə-ral ˊ), ***n.*** جۆرێکە لە توتن.
**capote** (kə-pōt'), ***n.*** (١) قاپووت؛ پاڵتۆی تەپلەدار؛ عەبای تەپلەدار.
(٢) تەپلەی ژنانە (بە شریتی ژێر چەناگە گرێ دەدرێت).
(٣) کڵاوە یا بۆنیتی ئوتومبیل.
**capriccio** (kə-prē'chi-ō), ***n.*** (١) حولحولێتی؛ ڕاڕایی.
(٢) پارچە ئاوازێکی چەند نەوا. (٣) گاڵتەوگەپ؛ کردەوەی شێتانەو سەیر
**caprice** (kə-prēs'), ***n.*** (١) حولحولێتی؛ ڕاڕایی؛ هەوەسکاری.
(٢) پارچە ئاوازێکی چەند نەوا.
**capricious** (kə-prish'əs), ***adj.*** حولحول؛ ڕاڕا؛ هەوەسکار.
**Capricorn** (kap'ri-kôrn ˊ), ***n.*** بورجی گیسك (ئەستێرەوانی).
**capriole** (kap'ri-ōl ˊ), ***n.*** (١) جووتە لێدان و هەڵبەزینەوەی ئەسپی
مەشق لە جێی خۆیدا. (٢) بازد؛ هەڵبەزینەوە.
***v.i.*** جووتە لێدان و هەڵبەزینەوە لە جێی خۆدا (ئەسپ)؛ هەڵبەزینەوە؛ بازدان.
**capsicum** (kap'si-kəm), ***n.*** دەلوبیبەری توون؛ بیبەر.
**capsize** (kap-sīz'), ***v.i.*** وەرگەڕان (بەلەم، کەشتی)؛ هەڵگەڕانەوە.
**capstan** (kap'stən), ***n.*** خولخولۆکەی لەنگەر هەڵکردن و قورسایی
بەرزکردنەوە (لەسەر کەشتی)؛ چەرخی لەنگەر هەڵکردن.
**capstone** (kap'stōn ˊ), ***n.*** (١) بەردی لێژی تەوقەسەری دیوار، پایە،
یا خانوو (کە بەشێکە لە گوێ سەبانەی لێژ بۆ ئاوەڕۆ).
(٢) پۆپە؛ لووتکە؛ تەوقەسەر.
**capsular** (kap'sə-lēr, kap'syoo-lēr), ***adj.*** (١) کەپسوولەیی؛
لە کەپسوولە دەچێت. (٢) لە کەپسوولەدایە؛ لە کیسەدایە.
**capsulate** (kap'sə-lāt ˊ, kap'syoo-lāt ˊ), ***adj.*** لە کەپسوولەدایە؛
لە کیسەدایە.

-capsulated *(adj.).*
**capsule** (kap′s'l, kap′syool), *n.* (١) کیسه؛ کیف.
(٢) قەپاغی شووشە یا بۆری؛ سەری شووشە.
(٣) کەپسوولە (دەرمان): کیفێکی جەلاتینی بچووکە خۆراکێك دەرمانی تێدایە (کە قووت درا دەتوێتەوە).
(٤) خانەی داخراو (لە کەشتی هەوایی یا فڕۆکەدا بۆ دانیشتن).
(٥) کەلوو؛ توێکل (دانەوێڵە)؛ بەرگ؛ قاوغ (تۆو، سەوزە).
(٦) کیسە؛ پەردە (توێکاری). (٧) دەفری تەنك (کیمیاگەری).
*adj.* کورتە؛ پوختە. *( a ~ biography)*.
**captain** (kap′t'n, kap′tin), *n.* (١) سەرۆك؛ پێشڕەو؛ رابەر.
(٢) (أ) کاپتن (سوپا)؛ سەرلق؛ سەرپەل. (ب) کاپتن (هێزی دەریایی).
(ج) کاپتن (کەشتی)؛ سەرەك کەشتی و کەشتییەوان. (د) کاپتن (پۆلیس).
(هـ) سەردەستە (ئاگرکوژێنەرەوە)؛ سەرپەل. (و) سەرتیپ (وەرزش).
(ز) سەرکار (کارگە، پیشەسازی). (ح) سەرلقی ناوچە (حیزب، کۆمەڵە).
(٣) سەرکردەیەکی گەورەی سوپا.
*v.t.* سەرکردەیی کردن؛ سەرگەورەیی کردن؛ رابەری کردن.
**captaincy** (kap′t'n-si, kap′tin-si), *n.* پلەی کاپتن یا سەرپەل.
**captainship** (kap′t'n-ship′, kap′tin-ship′), *n.* (١) کاپتنیتی.
(٢) سەرۆکایەتی؛ سەرکردایەتی؛ رابەرێتی؛ رابەری.
**caption** (kap′shən), *n.* (١) [Rare]، گرتن (بەندیخانە).
(٢) (أ) [British]، گرتن. (ب) بەڵگەنامەی گرتن. (ج) سەرباسی داوا (دادگا).
(٣) (أ) سەرباس (ووتار، بەند، لاپەرە). (ب) روونکردنەوەی ژێر یا سەر وێنەیەك (گۆڤار، رۆژنامە). (ج) نووسراوی سەر پەردەی تەلەفزیۆن و سینەما (فیلمی وەرگێڕاوی بیانی).
*v.t.* روونکردنەوە (وێنەی ناو رۆژنامەو گۆڤار)؛ سەرباس بۆ دانان؛ نووسینی وەرگێڕانی فیلمی بیانی لەسەر پەردەی سینەماو تەلەفزیۆن.
**captious** (kap′shəs), *adj.* (١) هەر بۆ مشتومڕە (پرسیار، پەلپ، تێبینی)؛ فڕوفێڵاوی؛ سەر لێ شێوێنەر؛ مەبەستی تێکەوتنی کەسەکەیە (پرسیار). (٢) خۆش رەخنە؛ هەر بۆ کەموکووڕی و هەڵە گەڕاو.
**captivate** (kap′tə-vāt′), *v.t.* (١) بە دیل گرتن؛ دەستبەسەرکردن؛ گرتن. (٢) دڵفڕاندن؛ گیرۆدەکردن.
*( She ~d his heart.;*
*He ~d the audience with his eloquence.)*
-captivation *(n.)*; captivator *(n.)*.
**captive** (kap′tiv), *n.* (١) دیل؛ بەند؛ دەستبەسەر.
(٢) دڵفڕێنراو؛ گیرۆدە؛ یەخسیر.
*adj.* (١) دیل کراو؛ دەستبەسەر؛ بەندکراو. (٢) دڵفڕێنراو؛ گیرۆدە؛ یەخسیر.
(٣) ناچارە هەر دەبێ لەوێ بێت.
**captive audience,** گوێگری دیل: کەسێك یا تاقمێك خەڵك کە ناچارن گوێ لە قسەکەرێك بگرن ئەگەرچی بە نابەدڵیش بێت.
**captivity** (kap-tiv′ə-ti), *n.* دیلی؛ دەستبەسەری.
**captor** (kap′tēr), *n.* دیلگر؛ داگیرکەر؛ بگر (مرۆڤی راکردوو، شار، وولات).
**capture** (kap′chēr), *n.* (١) گرتن بە زۆر یا لەپڕ (مرۆڤی هەڵاتوو، شار، وولات)؛ داگیرکردن؛ گرتن؛ بە دیل گرتن.
(٢) (أ) تالانی؛ نێچیر. (ب) گیراو؛ دیل.
*v.t.* (١) بە زۆر یا لەپڕ گرتن (مرۆڤ، شار، وولات)؛ دەستبەسەرکردن؛ داگیرکردن. (٢) بردنەوە (پێشبڕکێ).
(٣) راکێشان (سەرنج): *( to ~ someone's attention)*.
(٤) گرتن؛ گرتن و چەسپاندن: *( to ~ a likeness in a painting)*.
**car** (kär), *n.* (١) هۆی هاتوچۆی پێچکەدار؛ رەوڕەوەدار.
(٢) [Poetic]، **chariot**. (٣) پاسی هێڵی ئاسنی ناوشار.
(٤) ئۆتۆمبیل (هەروەها پێی دەووترێ: " **motorcar** ").
(٥) قەفەزەی پاپیلکەی کارەبایی.
(٦) خانەی کەرەسەو رانەرو رێبوارانی باڵۆن.
**carabao** (kä′rə-bä′ō), *n.* گامێشی ئاوی.

**carabin, carabine** (kar′ə-bin), *n.* = **carbine.**
**carabineer, carabinier** (kar′ə-bə-nêr′), *n.* = **carbineer.**
**caracul** (kar′ə-kəl), *n.* = **karakul.**
**carafe** (kə-raf′, kə-räf′), *n.* سوراحی.
**caramel** (kar′ə-m'l, kar′ə-mel′, kär′m'l), *n.* (١) شەکری سووتاوە دەکرێتە خواردەمەنییەوە بۆ تام و رەنگ.
(٢) جۆرە نوقوڵێکی قاوەیی نەرمە.
**carapace** (kar′ə-pās′), *n.* قاووغ (کیسەڵ، قرژاڵ).
**carat** (kar′ət), *n. Also* **karat,** (١) یەکەی سەنگی زێڕو بەردی بەنرخ؛ قیرات. (٢) بیست و چوار یەکی زێڕی چاك.
**caravan** (kar′ə-van′), *n.* (١) کاروان؛ قەتار.
(٢) کاروانی ئۆتۆمبیل. (٣) پاس؛ ئۆتۆمبیلی گەورەی سەرگیراو.
(٤) [British]، خانووی گوێزراوە.
**caravansary** (kar′ə-van′sə-ri), *n.* خان؛ ئوتێل؛ کاروان سەرا.
**caravanserai** (kar′ə-van′sə-rī′, kar′ə-van′sə-rā′), *n.* = **caravansary.**
**caravel, caravelle** (kar′ə-vel′), *n.* کەشتییەکی بایەوانی خێرایە.
**caraway** (kar′ə-wā), *n.* حەوڕنج: بەهاراتێکی بۆن تیژو خۆشە لە توخمی رەشکەو شمڵییە دەکرێتە ناو نان و پەنیرەوە.
**carbazole** (kar′bə-zōl′), *n.* کاربەزۆل: دارشتەیەکی سپی بلوورییە هەندێ رەنگ یا خومی لێ درووست دەکرێت.
**carbine** (kär′bīn), *n.* (١) تفەنگێکی لوولە کورتە (سەربازو پۆلیسی سوارە بەکاری دێنن). (٢) گوللەپڕژێنێکی سووکە.
**carbineer** (kär′bə-nêr′), *n. Also* **carabineer,** سەربازی تفەنگ لە شان.
**carbo-** (kär′bō, kär′bə), *Also* **carb-,** پێشگرێکە بەمانای: کاربۆن.
**carbohydrate** (kär′bə-hī′drāt), *n.* کاربۆهایدرات: بریتییە لە ناوێتەی کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین (وەك نیشاستەو شەکر).
**carbolated** (kär′ə-lā′tid), *adj.* ترشەڵۆکی کاربۆلیکی تێدایە.
**carbolic acid,** ترشەڵۆکی کاربۆلیك؛ فینۆل.
**carbolize** (kär′bə-līz′), *v.t.* (١) پاکژکردن بە ترشەڵۆکی کاربۆلیك.
(٢) ترشەڵۆکی کاربۆلیك تێکردن.
**carbon** (kär′bən), *n.* (١) کاربۆن؛ خەڵووز. (٢) کاغەزی کاربۆن.
(٣) وێنەی دەقاودەق (کە بە کاغەزی کاربۆن دەردێت).
(٤) شیش یا پەرەکی کاربۆن (لە پاتری و گڵۆپی کەوانەییدا بەکاردێت).
*adj.* کاربۆنی؛ کاربۆناوی؛ کاربۆنی تێدایە.
**carbonaceous** (kär′bə-nā′shəs), *adj.* (١) کاربۆنی تێدایە؛ کاربۆناوی. (٢) وەك خەڵووز؛ خەڵووزی.
**carbonado** (kär′bə-nā′dō), *n.* پارچەیەك گۆشتی ماسی یا مریشکی بە چەقۆ ئاژنراو و برژێنراو لە کوورەدا.
*v.t.* (١) بە چەقۆ ئاژنینەوەو برژاندن (گۆشتی مریشك و ماسی).
(٢) [Archaic]، هەڵدڕین؛ قاش کردن؛ جنین.
**carbonado** (kär′bə-nā′dō), *n.* ئەڵماسی رەش.
(هەروەها پێی دەووترێ: " **black diamond** ").
**carbonate** (kär′bən-it, kär′bə-nāt′), *n.* کاربۆنات.
*v.t.* (١) سووتاندن؛ کردن بە کاربۆن.
(٢) دووەم ئۆکسیدی کاربۆن تێکردن (وەك خواردنەوە).
-carbonated *(adj.)*; carbonator *(n.)*.
**carbonation** (kär′bə-nā′shən), *n.* (١) بوون بە کاربۆن.
(٢) دووەم ئۆکسیدی کاربۆن تێکردن.
**carbon copy,** *Abbreviated cc; C.C.; c.c.,* (١) وێنەی دەقاودەق.
(٢) [Colloq.]، کەسێك کە زۆر لە کەسێکی تر بکات؛ شتێك کە زۆر لە شتێکی تر بچێت.

**carbon dioxide,** دووەم ئۆکسیدی کاربۆن.
**carbonic** (kär-bon′ik), *adj.* (١) کاربۆناوی
(٢) لە کاربۆن دەرهێنراو.
**carbonic acid,** ترشەڵۆکی کاربۆنیک.
**carbonic acid gas,** = carbon dioxide.
**carboniferous** (kär′bə-nif′ẽr-əs), *adj.* (١) کاربۆن یا خەڵووزی تێدایە؛ کاربۆن یا خەڵووزی لێ دەردەهێنرێ.
(٢) [C-] چەرخی خەڵووز یا کاربۆن (مێژووی کۆن).
**the Carboniferous,** (١) چەرخی خەڵووز (مێژووی کۆن).
(٢) ئەو خەڵوورەی لەم چەرخەدا دروست بووە.
**carbonize** (kär′bə-nīz′), *v.t.* (١) کردن بە کاربۆن یا خەڵووز.
(٢) کاربۆن تێکەڵاوکردن؛ کاربۆن لێدان.
**-carbonization** *(n.).*
**carbon monoxide,** یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن.
**carbon paper,** کاغەزی کاربۆن (بۆ دەرکردنی وێنەی دەقاودەق).
**carbuncle** (kär′buŋ-k′l), *n.* (١) گەوهەری شەوچرا یا سوور.
(٢) موو (برین).
(٣) دوومەڵ.
**carburet** (kär′bə-rāt′, kär′byoo-ret′), *v.t.* (١) تێکەڵاوکردن لەگەڵ کاربۆن. (٢) هەوا یا گاز تێکەڵاوکردن لەگەڵ بەنزین (بۆ سووتاندن).
**-carburetion** *(n.).*
**carburetor, carburettor** (kär′bə-rā′tẽr, kär′byoo-ret′ẽr), *n.* کابرێتەر (ئوتومبیل): ئامێری تێکەڵاوکردنی هەوا و بەنزین بۆ سووتاندنی لە مەکینەدا.
**carburize** (kär′bə-rīz′, kär′byoo-rīz′), *v.t.* کاربۆن تێکەڵاو- کردن (ئاسن جۆشدان).
**-carburization** *(n.).*
**carcass, carcase** (kär′kəs), *n.* (١) لاک؛ لاشەی مردوو یا سەربڕراو.
(٢) لەش؛ لاشە (نادەمیزادی مردوو یا زیندوو) (لەڕووی سووکی یا گاڵتەوە).
(٣) قالۆر؛ قاپوور؛ قاووغی بەتاڵ و بێ کەڵک.
(٤) قاووغ یا چوارچێوەی شکاو یا ڕزیو (کەشتی، ئوتومبیل، خانوو)؛ لاشە؛ قاپوور؛ قالۆر. *( the ~ of an abandoned automobile.)*
**carcinogen** (kär-sin′ə-jən, kär′sin-ə-jen′), *n.* سندان لێدەر؛ ماددەی شێرپەنجە پێ گەیشتن.
**carcinogenic** (kär-sin′ə-jən′ik, kär′sin-ə-jen′ik), *adj.* شێرپەنجە تووشکەر؛ شێرپەنجەیی؛ سندان لێدەر: *( a ~ substance)*.
**carcinoma** (kär′sə-nō′mə), *n.* برینی شێرپەنجەیی؛ سندان.
**carcinomatosis** (kär′sə-nō′mə-tō′sis), *n.* تەنینەوەی- شێرپەنجە
**carcinomatous** (kär′sə-nom′ə-təs, kär′sə-nō′mə-təs), *adj.* شێرپەنجەیی؛ سندانی
**card** (kärd), *n.* (١) کارت: (أ) پۆستکارت: *( postcard)*.
(ب) کارت یا کاغەزی قومار و یاری.
(ج) کارتی جەژنە پیرۆزە: *( a Christmas ~ )*.
(د) کارتی سڵاوناردن: *( a greeting ~ )*
(هـ) کارتی لەدایکبوون: *( a birthday ~ )*.
(و) کارتی شایی: *( a wedding ~ )*.
(ز) ناسنامە؛ پێناس: *( an identification ~ )*.
(ح) کارتی دیدەنی (کە بەجێ دەهێڵرێت لە شوێنێك ئەگەر خاوەن ماڵەکە لە ماڵ نەبێت *( a calling ~ )*.
(٢) بەرنامەیەك یا ڕووداوێکی لەسەر کارت چاپکراو.
(٣) [Colloq.] کەسێکی سەرنج ڕاکێش (بە قسەی قووت و کردەوەی سەیر).
*v.t.* (١) کارت پێدان. (٢) (أ) خستنە سەر کارت. (ب) خستنە سەر کارت بۆ کەتەلۆگ کردن
**have a card up one's sleeve,** شتێکی بە دەستەوەیە یا لەژێر سەردایە بە کەس نائێت؛ پیلانی نهێنی؛ بە دەستەوە بوون.
**in ( or on ) the cards,** لەوانەیە ڕووبدات؛ بۆی هەیە ببێت:
*( Getting elected was not in the cards for him.)*
**one's best card,** باشترین ڕێباز بۆ دەستکەوتنی شتێك؛ باشترین هێزی بە مەبەست گەیشتن.
**play one's card well,** کارامەیی نواندن؛ زۆر بە دانایی و باشی دەوری خۆ بینین.
**put ( or lay ) one's cards on the table,** دەست خستنە ڕوو؛ پیلان و مەبەستی خۆ ئاشکراکردن.
**card** (kärd), *n.* قلچەی زبر (بۆ لە قلچەدانی تەنراوی تیسکن).
*v.t.* لە قلچەدانی تەنراوی تیسکن.
**cardamon, cardamum** (kär′də-məm), *n.* هێل.
**cardboard** (kärd′bôrd′, kärd′bōrd′), *n.* کارتۆن؛ مقەبا.
**card catalogue,** پێرستی کارت (بە ناو و ناونیشانی پەرتووك و گۆڤاری کتێبخانەیەك).
**card file,** = card catalogue.
**cardiac** (kär′di-ak′), *adj.* (١) تایبەتی بە دڵ؛ دڵ: *( a ~ arrest)*.
(٢) تایبەتی بە بەشی سەرووی گەدە؛ تایبەتی بە شوێنی بەیەکگەیشتنی قورگ و گەدە.
*n.* (١) نەخۆشی دڵ. (٢) دەرمانی دڵ.
**cardialgia** (kär′di-al′ji-ə), *n.* = heartburn.
**cardigan** (kär′di-gən), *n.* بلووسی قۆپچەدار؛ فانیلەی سەرەوەی قۆپچەدار.
**cardinal** (kär′d′n-əl, kär′di-n′l), *adj.* (١) سەرەکی؛ بنچینەیی؛ بناغەیی: *( a ~ rule of behavior)*. (٢) سوور؛ ئاڵ.
*n.* (١) کاردینال: قەشەی هەرە گەورە؛ سەرەك قەشە (لە ئاینی کاسۆلیکیدا).
(٢) ئاڵ؛ سوور. (٣) پاڵتۆیەکی کورتی سووری تەپلەداری ژنانەیە
(٤) cardinal bird.
(٥) ژمارەی دانەژمێر (یەك، دوو، حەوت، چل، هەزار... هتد).
(هەروەها پێی دەوترێ: " cardinal number ").
**cardinalate** (kär′d′n-əl-āt′, kär′di-n′l-āt′), *n.* (١) پلەوپایەو دەسەڵاتی کاردینال، واتە سەرەك قەشەی کاسۆلیکی.
(٢) ئەنجوومەنی کاردینالەکان.
**cardinal bird,** باڵندەیەکی بچووکی سووری دەنگ خۆشە (لە توخمی فیسقەیە).
**cardinal flower,** (١) ڕووەکێکی ئەمەریکییە لە شوێنی تەڕو سێبەر یا لە تەنکاودا دەڕوێت. (٢) گوڵی سووری ئەم ڕووەکە.
**cardinal number ( or numeral ),** ژمارەی دانەژمێر (یەك، دوو، شەش، دە، بیست، هەزار... هتد).
**cardinal points,** چوار لا سەرەکییەکەی قیبلەنما: باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.
**cardinalship** (kär′d′n-əl-ship′, kär′di-n′l-ship′), *n.* پلەو پایەو دەسەڵاتی کاردینال، واتە سەرەك قەشەی کاسۆلیك.
**cardinal virtues,** ڕەووشت چاکییە سەرەکییەکان: ژیری، دادپەروەری، خۆڕاگرتن لە کارەساتدا، میانڕەوی.
**card index,** = card catalogue.
**cardio-** (kär′di-ō, kär′di-ə), *Also* **cardi-,** پێشگرێکە بەمانای: دڵ؛ تایبەتی بە دڵ: *( cardiogram, cardiograph)*.
**cardiogram** (kär′di-ə-gram′), *n.* هێڵکاری دڵ: هێڵێکە لێدانی دڵ و گۆڕانی پیشان دەدات (پزیشکەوانی).
**cardiograph** (kär′di-ə-graf′, kär′di-ə-gräf′), *n.* ئامێری هێڵکاری لێدانی دڵ و گۆڕانی (پزیشکەوانی).
**-cardiographer** *(n.)*; **cardiographic** *(adj.)*; **cardiography** *(n.).*
**cardiologist** (kär′di-ol′ə-jist), *n.* پزیشکی دڵ؛

زانای دڵو نەخۆشییەکانی.

**cardiology** (kär´di-ol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی دڵ؛ زانستی دڵو نەخۆشییەکانی.

**carditis** (kär-dī′tis), *n.* هەوکردنی دڵ؛ نەخۆشی دڵ.

**cards** (kärdz), *n.pl.* (١) یاری کاغەز (کۆنکەن، بریج... هتد):
*( to play ~ )*
(٢) یاری کاغەز کردن.

**cardsharp** (kärd′shärp´), *n. Also* **cardsharper,** گزیکەری یاری کاغەز.

**care** (kâr), *n.* (١) خەموخەفەت؛ سوێ؛ خەم. (٢) مەراق؛ دڵەڕاوکێ.
(٣) ئەرك؛ هۆی مەراقو سەرئێشە؛ باك.
(٤) وریایی: *( handling with ~ )* .
(٥) سەرپەرشتی؛ چاودێری؛ پاراستن: *( in the ~ of a nurse)* .
(٦) ویستن؛ حەزکردن.
(٧) گوێ پێدان؛ بە گرنگ گرتن: *( a report prepared with great ~ )* .
*v.i.* (١) گوێ پێدان؛ بە لاوە گرنگ بوون؛ بە تەنگەوە هاتن:
*( I ~ .; I don't ~ .; Our parents don't ~ if we go swimming.)*
(٢) ویستن؛ حەزکردن: *( I don't ~ to answer.)* .

**care for,** (١) خۆشویستن؛ حەزلێکردن: *( I care for you.)* .
(٢) حەزلێکردن (شتومەك): *( She doesn't care for oranges.)* .
(٣) بە دڵ بوون: *( I don't care for that kind of behavior.)* .
(٤) چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن؛ ئاگا لێ بوون:
*( Who will care for you when you get sick?)*

**(in) care of, = c/o, c.o.,** بە هۆی (پۆستە)؛ لەڕێی:
*( She gets her mail in care of her parents.)*

**take care of,** (١) چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن؛ سەرپەرشتی کردن.
(٢) بەخێوکردن؛ پاراستن.

**careen** (kə-rēn′), *v.t.* (١) بەلاداخستنی کەشتی بۆ پاکردنەوە یا چاکردن. (٢) پاکردنەوە یا چاکردنی کەشتی (پاش بەلاداخستنی).
(٣) بەلاداخستن؛ خوارکردنەوە.
*v.i.* (١) بەلاداکەوتن (کەشتی بایەوانی).
(٢) بە لارەولار ڕۆیشتن؛ بەملاو بەولادا کەوتنو بەخێرایی ڕۆیشتن؛ لەتردان؛ بەلەسەبوون: *( a ~ing carriage, car, etc.)* .
*n.* (١) بەلاداکەوتن؛ خواربوونەوە.
(٢) بەملاو بەولادا کەوتن؛ بە لارەولارو بەخێرایی ڕۆیشتن.

**career** (kə-rêr′), *n.* (١) مەیدانی غارغارێن؛ مەیدانی پێشبڕکێ.
(٢) ڕێبازی خێرا؛ ڕێگەی تیژ. (٣) خێرایی؛ ئەوپەڕی خێرایی.
(٤) ڕێبازی ژیانی مرۆڤ. (٥) سەرکەوتنی مرۆڤێك لە پیشەو کارێکدا.
(٦) پیشە؛ فرمان؛ کار.
*v.i.* تێ تەقاندن؛ خێرا ڕاکردن؛ بەلەسەبوون.

**in full career,** بەوپەڕی خێرایی؛ زۆر بە خێرایی.

**careerism** (kə-rêr′iz'm), *n.* نۆکەرێتی پیشە: گوێدان تەنها بە پیشەی خۆو پێشکەوتن.

**careerist** (kə-rêr′ist), *n.* نۆکەری پیشە: کەسێکە کە تەنها گوێ بە پیشەکەی خۆیو پێشکەوتنی دەدات.

**carefree** (kâr′frē´), *adj.* بێباك؛ بێ خەم؛ سەرسووك.

**careful** (kâr′fəl), *adj.* (١) وریا؛ ئاگادار؛ هۆشیار؛ دووربین.
(٢) وورد (لێکۆڵینەوە): *( a ~ analysis)* .
(٣) بەتەنگەوەهاتوو؛ بە دەربەست.
(٤ [Archaic]، بە مەراق؛ غەمبار.

**carefully** (kâr′fəl-i), *adv.* (١) بە وریایی؛ بە لەسەرخۆیی.
(٢) بە ووردی؛ زۆر بە باشیو بە ڕێكوپێکی.

**careless** (kâr′lis), *adj.* (١) بێباك؛ بێ خەم؛ سەرسووك:
*( ~ little singing birds)*
(٢) گوێ پێ نەدەر؛ بە تەنگەوە نەهاتوو: *( a ~ student)* .
(٣) گوێ پێ نەدەر؛ بە تەنگەوە نەهاتوو:
*( The brave fire-fighters did their duty ~ of dangers.)*
(٤) لاسەرلا؛ باش نەکراو؛ بە ووردی نەکراو: *( ~ work)* .
(٥) (ا) لێ نەکۆڵراوە؛ هەڵەق مەڵەق؛ بە هەڵە لە دەم دەرچوو: *( a ~ remark)* .
(ب) ئەنجامی لێ نەکۆڵینەوەو ناووردییە: *( a ~ mistake)* .

**careless of,** گوێ پێ نەدەر (مەترسی)؛ بە تەنگەوە نەهاتوو:
*( We were careless of the dangerous consequences.)*

**-carelessness** *(n.)*.

**carelessly** (kâr′lis-li), *adv.* بە لاسەرلایی؛ بەبێ گوێ پێدان؛ بەبێ لێکۆڵینەوە: *( Don't do your work ~ .)* .

**caress** (kə-res′), *v.t.* (١) دەست پیاهێنان (لەڕووی خۆشەویستییەوە)؛ دەست پیاهێنانو ماچ کردن: *( to ~ someone's face, hair, etc.)* .
(٢) دڵنەوایی کردن؛ دڵ ڕاهێنان بە مەراییو کلکەلەقێ.
*n.* دەست پیاهێنانو ماچ کردن؛ ماچ؛ دەست پیاهێنان.

**caret** (kar′it, kâr′it), *n.* نیشانەی خستنە سەر: نیشانەیەکی گەورەی وەك ژمارە هەشتە ( Λ ) لە نووسیندا بەکاردێت بۆ شتی زیادە خستنە نێوان یا دانە دەم.

**caretaker** (kâr′tāk´ēr), *n.* (١) چاودێری شوێن، شت، یا کەسێك؛ چاودێریماڵو موڵکی کەسێك (بەتایبەتی کە خاوەنەکەی لەوێ نەبێت)؛ پاسەوان. (٢) چاودێر یا بەردەستی فەرمانگەی میریو شوێنی تری وەها؛ مجەوور. (٣) لێپرسراوی سەردەمی (فەرمانڕەوایی): *( a ~ government)* .

**careworn** (kâr′wôrn´, kâr′wōrn´), *adj.* خەم داگرتوو؛ ڕەنگ زەردو دەموچاو قووپاو (لە خەفەتدا)؛ تەپیو: *( a ~ face)* .

**carfare** (kär′fâr´), *n.* کرێی پاسی ناوشار؛ کرێی ئۆتومبیل.

**cargo** (kär′gō), *n. ( pl.* **cargoes, cargos** *),* (١) باری کەشتی، فڕۆکە، شەمەندەفەری بار، یا ئۆتومبیل. (٢) بار.

**carhop** (kär′hop´), *n.* بەردەستی چێشتخانەیەك بەتایبەتی ئافرەت کە خواردن دەبات بۆ کڕیارەکان لە ئۆتومبیلەکانیاندا.

**caribou** (kar′ɔ-bōō´), *n.* ئاسکەکێوییەکی شاخ پەلکداری ئەمەریکای باکوورە.

**caricature** (kar′i-kə-chēr, kar′i-kə-choor´), *n.* (١) وێنەی-کاریکاتێری: وێنە، نووسین، یا نواندنێك کە لاساییەکی بێ ئەندازەی کەسێك یا شتێك دەکاتەوە بۆ گاڵتەپێکردن یا پێکەنین.
(٢) ئەم جۆرە هونەرە؛ هونەری لاسایی کردنەوەی کاریکاتێری.
(٣) لاسایی کردنەوەیەکی قەڵبو بێ مانا.
*v.t.* وێنەی کاریکاتێری کردن؛ لاسایی کردنەوەی بێ ئەندازە بە وێنە، نووسین، یا نواندن بۆ گاڵتەپێکردنو پێکەنین.

**caricaturist** (kar′i-kə-chēr-ist, kar′i-kə-choor´ist), *n.* هونەرمەندی کاریکاتێر.

**caries** (kâr′ēz, kâr′i-ēz´), *n.* ئێسقانو ددان ڕزین.

**carillon** (kar′ɔ-lon´, kə-ril′yɔn), *n.* (١) دەستەیەك زەنگی هەمە-ئاوازە بە ئۆتۆماتیکی لێ دەدرێن. (٢) ئاوازی دەستەیەك زەنگی وەها
*v.i.* لێدانی دەستەیەك زەنگی هەمە ئاواز.

**carillonneur** (kar´ə-lə-nūr′), *n.* زەنگ لێدەر (ووشەی پێشوو ببینە).

**carina** (kə-rī′nə), *n.* ئێسکەکۆڵەی بەرسنگی باڵندە؛ نووکی ئێسکەکۆڵە؛ تیغە.

**carinate** (kar′i-nāt´), *adj. Also* **carinated,** ئێسکەکۆڵەدار؛ تیغەدار.

**cariole, carriole** (kar′i-ōl´), *n.* (١) گالیسکەی بچووکی یەك ئەسپی. (٢) تریشقەی سەرگیراو؛ گالیسکەی بار.

**cariosity** (kâr´i-os′ə-ti), *n.* ڕزینی ددانو ئێسقان؛ کلۆری.

**carious** (kâr′i-əs), *adj.* ڕزیو (ددان، ئێسقان)؛ کلۆر.

**carking** (kär′kiŋ), *adj.* [Archaic or Poetic], پەستکەر؛ ناخۆش؛ سەرئێشاوی.

**carl, carle** (kärl), *n.* (١) [Archaic]، کشتکار؛ لادێیی.
(٢) [Scot.]، کەسێکی کەرتڕ یا بێ ئەزاکەت.
(٣) [Scot.]، کەسێکی چڕو کەتە. (٤) [Obs.]، کۆیلە.
**carline** (kär′lin), *n.* [Scot.], (١) پیرێژن. (٢) پیرێژنێکی ناشرین.
**carling** (kär′liŋ), *n.* دەستەک کەشتی).
**carload** (kär′lōd′), *n.* پڕ ئوتومبیلێک؛ باری ئوتومبیلێک.
**carmagnole** (kär′mən-yōl′), *n.* (١) بەرگی شۆڕشگێڕەکانی فەرەنسا (١٧٩٢) کە بریتی بوو لە چاکەتێکی یەخە پانو پانتۆڵێکی ڕەشو تەپلەیەکی سوور. (٢) سەربازێکی شۆڕشی فەرەنسا.
(٣) کارمەنیۆل: سەماو گۆرانییەکی بەجۆشی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسییە.
**carman** (kär′mən), *n.* (١) شۆفێری پاسی ناوشار.
(٢) (ا) شۆفێر. (ب) لێخوڕی عەرەبانەی تریشقە؛ عەرەبانچی بار؛ بارگوێزەرەوە (بە گالیسکە یا لۆری).
**carminative** (kär-min′ə-tiv, kär′mi-nā′tiv), *adj.* باوبڕە لە سكو ڕیخۆڵە دەرکەر.
*n.* دەرمانی باوبڕەدەرکەر لە سكو ڕیخۆڵەدا.
**carmine** (kär′min, kär′mīn), *n.* (١) ڕەنگی ئاڵ یا سوور.
(٢) بۆیەی ئاڵ یا سوور.
*adj.* ئاڵ؛ سوور.
**carnage** (kär′nij), *n.* (١) کوشتارێکی زۆر؛ قەلاچۆکردن؛ خوێن ڕشتن.
(٢) لاشەی کوژراو.
**carnal** (kär′n'l), *adj.* (١) لەشی؛ تایبەتی بە لەشو گۆشتو هەست.
(٢) ئالۆشی؛ تایبەتی بە هەستی جووت بوون: *( ~ desire)*.
**have carnal knowledge of,** جووت بوون لەگەڵ؛ چوونە جێ لەگەڵ؛ گاین
**-carnalist** *(n.)*; **carnally** *(adv.)*.
**carnal knowledge,** جووت بوون؛ گان.
**carnality** (kär-nal′ə-ti), *n.* (١) خۆشی لەش پەرستی؛ ئالۆش.
(٢) جووت بوون؛ گان.
**carnassial** (kär-nas′i-əl), *adj.* تایبەتی بە ددانی پێشی کاکیلە؛ تایبەتی بە پێشی کاکیلە.
*n.* ددانی پێشی کاکیلە.
**carnation** (kär-nā′shən), *n.* (١) (ا) سووری کاڵ؛ پەمەیی.
(ب) سووری تۆخ؛ ئاڵ. (٢) گوڵەمێخەك؛ مێخەك. (٣) ڕووەکی مێخەك.
**carnauba** (kär-nou′bə), *n.* دارەمێو: درەختێکی دارخورمایی بەرازیلییە مێوی لێ دەردەهێنرێتو دەکرێت بە مۆم.
**carnelian** (kär-nēl′yən), *n. Also* **cornelian,** گەوهەری سوور.
**carnival** (kär′nə-v'l), *n.* کەرنەڤاڵ: ئاهەنگو زەماوەند.
**carnivore** (kär′nə-vôr′, kär′nə-vōr′), *n.* (١) گیانداری- گۆشتخۆر (٢) ڕووەکی جانەوەرخۆر.
**carnivorous** (kär-niv′ə-rəs), *adj.* گۆشتخۆر
**carob** (kar′əb), *n.* (١) خرنووك. (٢) دارخرنووك.
**carol** (kar′əl), *n.* گۆرانی کریسمەس: *( Christmas ~ )*.
*v.i.* گۆرانی کریسمەس ووتن.
*v.t.* گۆرانی پیاداهەڵدان؛ گۆرانی بۆ ووتن.
**carom** (kar′əm), *n. & v.i.* (١) لێدانی دوو تۆپ بە یەك جار (بلیارد).
(٢) لێدانو هەڵگەڕانەوەی تۆپێك (پاش ئەوەی کە بەر شتێك دەکەوێت).
**carotene** (kar′ə-tēn′), *n. Also* **carrotene, carotin,** کارۆتین: ماددەیەکی زەردی پرتەقاڵی یا سوورە لە گێزەرو هەندێ سەوزەی تردا هەیە دەبێت بە ڤیتامین ( A ) لە لەشدا.
**carotid** (kə-rot′id), *n.* شادەماری لامل.
*adj.* تایبەتی بە یەکێك لە دوو شادەمارەکەی لامل.
**carotin** (kar′ə-tin), *n.* = **carotene.**
**carousal** (kə-rouz′'l), *n.* خواردنەوەو زەماوەند.
**carouse** (kə-rouz′), *v.i.* خواردنەوەو زەماوەند گێڕان.
*n.* (١) خواردنەوەو زەماوەند.
(٢) [Obs.]، پەرداخێك مەی کە بە یەك جار هەڵبقوڕێنرێ.
**carousel, carrousel** (kar′ə-zel′, kar′oo-sel′), *n.* (١) یاری چەرخوفەلەکی ئەسپ. (٢) غارغارێن؛ خۆنواندنو پێشبڕکێی ئەسپ سوار.
**carp** (kärp), *n.* جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارو گۆماوە.
**-carp** (kärp), پاشگرێکە بەمانای: میوە؛ بەر؛ تایبەتی بە میوە.
**carpal** (kär′p'l), *adj.* مەچەکی.
*n.* ئێسقانی مەچەك.
**carpale** (kär-pā′li), *n.* = **carpal.**
**carpel** (kär′p'l), *n.* نێرك؛ ئەندامی مێینەی گوڵ.
**carpenter** (kär′pən-tēr), *n.* دارتاش.
*v.i. & v.t.* دارتاشی کردن.
**carpentry** (kär′pən-tri), *n.* پیشەی دارتاشی.
**carpet** (kär′pit), *n.* فەرش؛ بەڕە؛ ژێرەخەر.
*v.t.* فەرش پێدا ڕاخستن؛ داپۆشین:
*( to ~ a room, the stairs, etc.; ~ed with flowers)*
**on the carpet,** (١) لێی دەکۆڵرێتەوە. (٢) خەریکە سەرزەنشت بکرێت.
**sweep under the carpet,** کردن بە ژێرەوە؛ شاردنەوە.
**carpetbag** (kär′pit-bag′), *n.* جەواڵ؛ خەرار؛ گونیە.
**carpetbagger** (kär′pit-bag′ēr), *n.* (١) جەواڵ بە شان: ئەمەریکییەکی ناوچەکانی باکوورە کە دوای شەڕی براکوژی ئەمەریکا (١٨٦١-١٨٦٥) گواستییەوە بۆ ناوچەکانی باشوور بە هیوای دەوڵەمەند بوون (لەڕووی سووکییەوە دەووترێت چونکە ئەم کەسانە هەموو سامانەکەیان هەر پڕ بە جەواڵێك بووە پێش ئەوەی بگوێزنەوە). (٢) کەسێکی هەلپەرست
(٣) ئەندامێکی پەرلەمانی ئینگلیزی کە نوێنەری ناوچەیەکە خۆی تێیدا ناژی یا تازە گواستوویەتییەوە بۆ ئەو ناوچەیە تەنها بۆ ئەوەی ببێت بە نوێنەری.
**carpeting** (kär′pit-iŋ), *n.* (١) فەرش؛ بەڕە؛ ژێرەخەر.
(٢) کەرەسەی فەرشو بەڕە درووستکردن (خوری، دەزوو، چنراو).
**carpet knight,** سوارچاکی دیوەخان؛ سوارچاکی بەر ئاگر: سەربازێك یا سوارچاکێکە کە نەچووبێتە جەنگەوە.
**carpet sweeper,** گسکی کارەبایی.
**carpetweed** (kär′pit-wēd′), *n.* گیایەکی نەرمە وەك فەرش.
**carping** (kär′piŋ), *adj.* بەڕەختە؛ هەمیشە کەموکووڕی دۆزەرەوە.
**carpo-** (kär′pō, kär′pə), پێشگرێکە بەمانای: میوە؛ تۆو.
**carpology** (kär-pol′ə-ji), *n.* میوەناسی؛ زانستی میوەو تۆو.
**carpophagous** (kär-pof′ə-gəs), *adj.* میوەخۆر.
**carport** (kär′pôrt′, kär′pōrt′), *n.* سەیوانی ئوتومبیل (بەتەنیشت ماڵەوە)؛ شوێنی سەرگیراوی ئوتومبیل وەستاندن.
**carpus** (kär′pəs), *n.* (١) مەچەك. (٢) ئێسقانی مەچەك.
**carrack, carack** (kar′ək), *n.* کەشتییەکی بایەوانی گەورەیە (بۆ جەنگو بازرگانیش بەکاردێت).
**carrageen, carragheen** (kar′ə-gēn′), *n.* گیای ئاوی؛ قەوزەی ئێرلەندی.
**carrel, carrell** (kar′əl), *n.* ژوورۆچکە، قەفەز یا خانەچکەی خوێندنەوە لە کتێبخانەدا.
**carriage** (kar′ij), *n.* (١) گواستنەوە؛ هەڵگرتن. (٢) کرێ (گواستنەوە).
(٣) جێبەجێکردن؛ بەڕێوەبردن. (٤) ڕەوت؛ شێوەی بەڕێوە ڕۆیشتن، وەستان یا سەر ڕاگرتن. (٥) ڕەووشت؛ ڕەفتار؛ هەڵسانو دانیشتن.
(٦) گالیسکە؛ عەرەبانە. (٧) [British]، فارگۆنی شەمەندەفەر.
(٨) چوارچێوەیەکی ڕەوڕەوەدارە بۆ شتی قورس لەسەر دانان: *( a gun ~ )*.
(٩) بەشی بزۆکو هەڵگری ئامێرێك: *( the ~ of a typewriter)*.
**carriage dog,** = **Dalmatian.**
**carriage trade,** کڕیار یا مەعمیلی دەوڵەمەندی چێشتخانەو سینەما (کە بە گالیسکەی تایبەتی خۆیان دەچوون).
**carrick bend,** جۆرە گرێیەکە (بۆ پێکەوە بەستنی دوو پەت).

**carrier** (kar′i-ēr), *n.* (١) پۆستەچی؛ هەڵگر *( a mail ~ )*.
(٢) کۆمپانیای گواستنەوە. (٣) (ا) پەیامبەر. (ب) کۆڵکێش؛ باربەر؛ حەماڵ.
(٤) کۆتری پەیامبەر. (٥) میکرۆب هەڵگر یا گەیەنەر (مرۆڤ یا گیاندار بەتایبەتی کە خۆی نەخۆشی‌یەکە نەگرێت). (٦) دەفر یا ڕێبازی گواستنەوە.
(٧) شەپۆلی گوێزەرەوە (رادیۆ). (٨) فڕۆکەهەڵگر: *( aircraft ~ )*.
(٩) ماددەی بزوێنەر یا هەڵگر (کە ماددەیەکی لە ئاوێتەیەکەوە پێ دەگوێزرێتەوە بۆ ئاوێتەیەکی تر :کیمیا).
**carrier pigeon,** کۆتری پەیامبەر.
**carriole** (kar′i-ōl′, kar′i-ôl′), *n.* = **cariole.**
**carrion** (kar′i-ən), *n.* لاشەی بۆگەن؛ لاکی بۆگەن کردوو.
*adj.* (١) تایبەتی بە لاشەی بۆگەن. (٢) لاشەی بۆگەنخۆر.
(٣) بۆگەن؛ بۆگەن کردوو
**carrion crow,** قەلەڕەشکەی لاشەی بۆگەن خۆر.
**carrom** (kar′əm), *n. & v.i.* = **carom.**
**carrot** (kar′ət), *n.* گێزەر.
**carroty** (kar′ət-i), *adj.* (١) ڕەنگ گێزەری؛ پرتەقاڵی: *( ~ hair)*.
(٢) قژ سووری پرتەقاڵی؛ سەرسوور.
**carrousel** (kar′ə-zel′, kar′oo-sel′), *n.* = **carousel.**
**carry** (kar′i), *v.t.* (١) گواستنەوە؛ هەڵگرتن:
*( ~ a package, the mail, etc.)*
*( That pipe ~ies water.)* (٢) بردن؛ گواستنەوە؛ گەیاندن:
(٣) پاڵ پێوەنان؛ هاندان؛ والێکردن:
*( His interests ~ied him into the study of history.)*
*( The air ~ies sounds.)* (٤) هەڵگرتن؛ بردن:
(٥) بە دەستەوە گرتن (کۆکردنەوە، ژماردن)؛ سەرجەم گواستنەوە بۆ شەقڵ یا لاپەڕەیەکی تر (دەفتەرگری).
*( ~ a fence over a certain distance)* (٦) درێژکردنەوە؛ دانە دەم:
(٧) گرتن (قەڵا)؛ داگیرکردن.
*( to ~ a region in an election)* (٨) بردنەوە (هەڵبژاردن، مشتومڕ):
(٩) ڕاکێشان (گوێگران)؛ کارتێکردن.
(١٠) [Archaic]، هاودەمی کردن؛ لەگەڵ چوون.
*( She is ~ing a child in her arms.)* (١١) هەڵگرتن:
*( The job ~ies a big responsibility.)* (١٢) هەڵگرتن (ئەرك)
(١٣) سکپڕبوون بە.
*( His statement ~ies conviction.)* (١٤) لەگەڵدا بوون:
*( He ~ies a watch.)* (١٥) پێ بوون:
(١٦) ڕەوتی جوان کردن؛ جوان چوون بەڕێوەو سەر ڕاگرتن:
*( The horse ~ies himself well.)*
*( How does she ~ herself?)* (١٧) ڕەووشت نواندن؛ ڕەفتارکردن:
(١٨) هەبوون:
*( The shop ~ies all kinds of fruits and vegetables.)*
(١٩) (ا) بەخێوکردن؛ هێنانە بەرهەم. (ب) بەرگرتن (میوە).
(٢٠) شوێن پێ هەڵگرتن؛ شوێن بۆن کەوتن (ڕاو).
*( I can ~ a tune very well.)* (٢١) ووتن (گۆرانی، ئاوان):
*v.i.* (١) گەیاندن؛ هەڵگرتن؛ بردن.
(٢) گەیشتن؛ بڕکردن؛ مەودا هەبوون:
*( That shot ~ied to the next hill.)*
(٣) سەر ڕاگرتن بە شێوەیەکی تایبەتی (ئەسپ)؛ ڕەوتێکی تایبەتی هەبوون.
*n.* (١) مەودا (گوللە، تۆپی گۆلف)؛ ماوەی بڕکردن.
(٢) بەلەم یا بار گواستنەوە بەسەر زەویدا لەنێوان دوو ڕووبار یا دەریاچەدا.
(٣) هەڵگرتن؛ بردن؛ گواستنەوە.
**carry away,** ڕامالین بە جۆش‌وخرۆش؛ خۆ لەبیربردنەوە؛ جۆش‌وخرۆش تێخستن‌و شێت کردن؛ لە تام کردنە دەرەوە:
*( Don't get carried away.; carried away by desire)*
**carry forward,** (١) پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە؛ بەرەو پێشەوە بردن:
*( carry forward the program)*
(٢) گواستنەوەی سەرجەمی حسابێك بۆ شەقڵ یا لاپەڕەیەکی تر (دەفتەرگری).
**carry off,** (١) کوشتن: *( The disease carried off thousands.)*.
(٢) بردنەوە (خەڵات).
(٣) بە جوانی و باشی و ڕێك‌وپێکی چارەسەرکردن. (٤) ڕفاندن.
(٥) شان دانە بەرو دەربردن بە ئازایانە (ناخۆشی).
**carry on,** (١) کردن؛ بەڕێوەبردن: *( carry on the affairs of state)*.
(٢) خەریك بوون؛ بەشداربوون: *( carry on a love affair)*.
(٣) بەردەوام بوون لەسەر: *( to carry on in the face of disaster)*.
(٤) [Colloq.]، ڕەووشتی مندالانە، شێتانە، یا بەرەڵایانە نواندن.
**carry out,** (١) خستنەگەڕ؛ کارپێکردن؛ کردن: *( carry out a plan)*.
(٢) پەیڕەوی کردن؛ لەسەر ڕۆیشتن: *( carry out orders)*.
(٣) هێنانەدی؛ تەواوکردن؛ جێبەجێکردن.
**carry over,** (١) سەرجەم گواستنەوە بۆ شەقڵ یا لاپەڕەی تر (دەفتەرگری).
(٢) دواخستن.
(٣) هێشتنەوە بۆ کاتێکی تر؛ هەڵگرتن بۆ کاتێکی تر (گفتوگۆ):
*( carry over a problem until the next meeting.)*
**carry the day,** سەرکەوتن؛ بردنەوە: *( He carried the day.)*.
**carry through,** (١) هێنانەدی؛ تەواوکردن؛ جێبەجێکردن.
(٢) خۆڕاگرتن؛ یارمەتیدان بۆ دەربردن:
*( Patience carried him through the ordeal.)*
**carryall** (kar′i-ôl′), *n.* (١) گالیسکەیەکی سووکی یەك ئەسپی سەرگیراوە (شوێنی چەند کەسێکی تێدا دەبێتەوە).
(٢) ئوتومبیلێکە پشتەکەی دوو کورسی درێژی تێدایە لە باری درێژی.
**carryall** (kar′i-ôl′), *n.* کیسە یا زەمیلەیەکی گەورە؛ جانتا.
**carrying charge,** قازانجی ئەو قەرزەی ماوەتەوە.
**carryings-on** (kar′i-iŋz-on′), *n.pl.* [Colloq.], چاوبازی؛ بەرەڵایی؛ ڕەووشتی مندالانەو ناشرینانە.
**carry-over** (kar′i-ō′vēr), *n.* (١) سەرجەمی ژمارەی گوێزراوە بۆ شەقڵ یا لاپەڕەیەکی تر (دەفتەرگرتن).
(٢) پاشماوە؛ شتێك کە لە ڕابوردووەوە مابێتەوە:
*( It is a ~ from the past.)*
(٣) شتی هەڵگیراو بۆ دواڕۆژ؛ پاشماوە.
**car-sick** (kär′sik′), *adj.* گێژی‌ی ئوتومبیل.
**cart** (kärt), *n.* (١) گالیسکەی بار؛ عەرەبانەی شت گواستنەوە.
(٢) عەرەبانەی دەستی شت گواستنەوە.
*v.t. & v.i.* گواستنەوە یا بردن بە عەرەبانەی بار؛ بەکێش کردن.
**put the cart before the horse,** کردنی کارێك بە پێچەوانەوە؛ نەکردنی شت لە جێی خۆیدا.
**cartage** (kär′tij), *n.* (١) گواستنەوە (بە گالیسکە).
(٢) کرێی گواستنەوەی شت.
**carte** (kärt), *n.* (١) **menu** . (٢) (ا) کاغەزی یاری.
(ب) (*pl.*)، یاری کاغەز. (٣) [Archaic]، **chart** .
**carte blanche,** دەسەڵاتی بێ سنوور؛ دەسەڵاتی تەواو:
*( The director has a ~ to do what he wants.)*
**cartel** (kär-tel′, kär′t'l), *n.* (١) مەیدانخوازی نووسراو (شیربازی).
(٢) پەیمانی نێوان دوو وڵاتی جەنگاوەر (بۆ ئاڵوگۆڕکردنی دەستبەسەران).
(٣) کارتێل: یەکێتی دەستگا پیشەسازی، بەرهەمهێنەری، یا بازرگانی‌یەکان (بۆ کەمکردنەوەی بەربەرەکانی ناوبازاڕ). (٤) [C-]، بەرەی ڕامیاری.
**cart horse,** بارگیر؛ ئەسپی عەرەبانە؛ ئەسپی بار.
**cartilage** (kär′t'l-ij), *n.* کڕکڕاگە.
**cartilaginous** (kär′t'l-aj′ə-nəs), *adj.* کڕکڕاگەیی.
**cartload** (kärt′lōd′), *n.* (١) پڕ عەرەبانەیەکی بار.
(٢) [Colloq.]، زۆر؛ گەلێك.
**cartogram** (kär′tə-gram′), *n.* نەخشە (جوگرافیا).

**cartographer** (kär-tog′rə-fẽr), ***n.*** نەخشەکێش (جوگرافیا)
**cartography** (kär-tog′rə-fi), ***n.*** نەخشەکێشی؛ نەخشەکاری.
**carton** (kär′t'n), ***n.*** (١) سنووقی مقەبا؛ کارتۆن. (٢) پڕ سنووقێکی مقەبا. (٣) (ا) نیشان. (ب) گوللەی نیشان شکێن.
**cartoon** (kär-to͞on′), ***n.*** (١) وێنەی کاریکاتێری؛ وێنەی لاقرتێ یا گاڵتەوگەپی (لە ڕۆژنامەو گۆڤاردا)؛ کارتوون. (٢) نەخشەی پێشەکی. (٣) comic strip.
***v.t. & v.i.*** وێنەی کاریکاتێری کردن؛ دەربڕینی چیزێك بە وێنەی لاقرتێ و گاڵتەوگەپی.
-cartoonist *(n.).*
**cartouche, cartouch** (kär-to͞osh′), ***n.*** (١) نەخشێکی جوان (خانووسازی). (٢) نەلقەیەکی هێلکەیی یا لاکێشەیییە لەسەر پەیکەری فیرعەونەکانی میسری کۆن ناو و ناونیشانی لەسەر دەنووسرا. (٣) قەوانی تەقەمەنی (فیشەکەشێتە، دەمەرقاچان). (٤) (ا) گوللە؛ فیشەك؛ قەپاغی گوللە. (ب) قەباغی فیلم؛ لوولەی فیلم.
**cartridge** (kär′trij), ***n.*** (١) (ا) گوللە؛ فیشەك. (ب) قەوانی گوللە (٢) قەباغی فیلمی کامێرا؛ لوولەی فیلم (٣) کیفی دەرزی (سنووقی قەوان و گۆرانی).
**cartridge belt,** فیشەك لەغ.
**cartridge clip,** شانە گوللە.
**caruncle** (kar′əŋ-k'l, kə-ruŋ′k'l), ***n.*** (١) پۆپنە. مریشك و کەڵەشێر. (٢) ئاوساوی قنگی دانەوێڵە
**carve** (kärv), ***v.t.*** (١) داتاشین (پەیکەر). (٢) هەڵکەندن (ناو و نەخش لەسەر دار): *( He ~d his name on wood.)*. (٣) بەدەستهێنان بە زیرەکی و هەوڵدان؛ بۆ خۆ درووستکردن:
*( He ~d a career for himself.)*
(٤) (ا) قاش کردن؛ بڕین (گۆشت)؛ لەتکردن: *( ~ the meat)*. (ب) (~ up): دابەشکردن؛ پارچەپارچە کردن؛ بەشکردن:
*( to ~ up a country, an estate, a piece of land)*
***v.i.*** (١) داتاشین (پەیکەر) (٢) گۆشت بڕین یا لەتکردن
**carven** (kär′vən), *archaic past participle of* carve.
***adj.*** [Archaic or Poetic]. (١) هەڵکەنراو (نەخشە) (٢) داتاشراو
**carver** (kär′vẽr), ***n.*** (١) گۆشت لەتکەر؛ گۆشتبڕ. (٢) پەیکەرتاش (٣) چەقۆی گۆشت؛ کێرد.
**carving** (kär′viŋ), ***n.*** (١) پەیکەرتاشی؛ داتاشین. (٢) پەیکەر؛ نەخش؛ نەخشی هەڵکەنراو.
**carving fork,** چەتاڵێکی گەورەیە گۆشتی پێ دەگیرێ بۆ لەتکردنی.
**carving knife,** چەقۆی گۆشت لەتکردن؛ کێرد.
**caryatid** (kar′i-at′id), ***n.*** پایەیەکە لە شێوەی ئافرەتدا (خانووسازی).
**caryopsis** (kar′i-op′sis), ***n.*** دانەوێڵەی یەك دەنکی (گەنم، جۆ).
**casaba, cassaba** (kə-sä′bə), ***n.*** کاڵەکێکی تۆنکل زەردی شیرینە. (هەروەها پێی دەوترێ: " casaba melon ").
**cascade** (kas-kād′), ***n.*** (١) تاڤگەی بچووك؛ ڕیزە تاڤگەی بچووك؛ دانەیەك لەم ڕیزە تاڤگەیە. (٢) شتێك کە بەخوڕ بێتە خوارەوە؛ یەکێك لە ڕیزە شتێك کە لەپڕو بە لێژی بێتە خوارەوە (پرێشك، پەردە).
***v.t. & v.i.*** بەخوڕ هاتنەخوارەوە بەبێ وەستان.
**cascara** (kas-kâr′ə), ***n.*** (١) جۆرە درەختێکە تۆنکڵەکەی دەکرێتە دەرمانی خەم ڕەوێنی و ڕەوانی. (٢) cascara sagrada.
**cascara buckthorn,** = cascara.
**cascara sagrada,** " کاسکارا " تۆنکلی ووشك کراوەی دار یا دەوەنی یە کە دەرمانی خەم ڕەوێنی و ڕەوانی لێ دەگیرێت.
**case** (kās), ***n.*** (١) تووش بوون (نەخۆشی): *( a ~ of measles)*. (٢) نەخۆشی. (٣) باری مەسەلەیەك؛ مەسەلە: *( State the ~ briefly.)*. (٤) داوا (دادگا)؛ داواکاری:
*( The ~ for the defendant was presented by his lawyer.)*
(٥) بەڵگەی پێ سەلمێنەر: *( He has no ~.; You have a strong ~.)*. (٦) داوایەکی لێکۆڵراوەی ڕابوردوو (دادگا). (٧) نموونەی گیروگرفتاوی: *( This child is a difficult ~.)*. (٨) [Slang]، کەسێکی سەیر: *( He's a ~!)*. (٩) شێوەی ناوو جێناوو ناوەڵناو (ڕێزمان).
***v.t.*** [Slang]. بە ووردی لێ ووردبوونەوە؛ هەڵسەنگاندن:
*( He ~d the house before robbing it.)*
in any case, هەرچۆنێك بێت.
in case, ئەگەر؛ ئەگەر هاتوو.
in case of, ئەگەر وابوو؛ ئەگەر وا ڕوویدا.
in no case, بە هیچ جۆرێك؛ هەرگیز.
make a case of, بەڵگە بۆ هێنانەوە.
state one's case, بەڵگە بۆ ڕای خۆ هێنانەوە؛ بە بەڵگەوە هەڵوێستی خۆ ڕوونکردنەوە.
**case** (kās), ***n.*** (١) سنووق؛ دەفر؛ کیف؛ توورەکە؛ بەرگ؛ قوتوو؛ جانتا. (٢) قاوغی شووشەیی؛ شووشە: *( a watch ~)*. (٣) پڕ سنووقێك؛ سنووقێك: *( a ~ of beer)*. (٤) جووت؛ دەستە: *( a ~ of pistols)*. (٥) (ا) چوارچێوە (پەنجەرە، دەرگا). (ب) جامخانە. (٦) خانەی تیپی چاپنووس: *( upper ~ ; lower ~ )*.
***v.t.*** (١) خستنە سنووقەوە؛ کردنە دەفرەوە؛ کردنە توورەکە یا کیسەوە. (٢) بەرگ تێگرتن؛ دەورگرتن؛ داپۆشین. (٣) ڕەنگ کردن (شووشە).
**caseate** (kā′si-āt′), ***v.i.*** بوون بە پەنیر.
**caseation** (kā′si-ā′shən), ***n.*** (١) بوون بە پەنیر. (٢) پووکانەوەو بەئاسانی هەڵپرووان و وەك پەنیری ووشك لێهاتنی ڕیشاڵی لەش.
**caseharden** (kās′här′d'n), ***v.t.*** (١) سەخت کردنی دیوی دەرەوەی ئاسن و پۆڵا. (٢) هەست کوشتن؛ دڵ مراندن.
**case history,** ژیاننامەو ڕابوردووی کەسێك یا تاقمێك (بۆ لێکۆڵینەوەی نەخۆشی و ژیانی کۆمەڵایەتی).
**case knife,** (١) چەقۆی کیفدار. (٢) چەقۆی سەرمێزی نانخواردن.
**case law,** یاسای لەسەر ڕابوردوو دانراو.
**casemate** (kās′māt′), ***n.*** ژوورۆچکەی گوللەبڕە کە کونی تێدایە بۆ تفەنگ لێوە تەقاندن (قەڵا، کەشتی جەنگی).
**casement** (kās′mənt), ***n.*** (١) پەنجەرەیەکی دوولایە کە وەك دەرگا بۆ دەرەوە دەکرێتەوە. (٢) قەپاغ؛ بەرگ؛ کیف؛ قاوغ.
**caseous** (kā′si-əs), ***adj.*** پەنیری؛ وەك پەنیر.
**casern, caserne** (kə-zūrn′), ***n.*** ئۆردووگا.
**case shot,** (١) قەپاغی ساچمە. (٢) ساچمە.
**case system,** فێرکردنی قوتابیانی دانشگای یاسا لەڕێی لێکۆڵینەوەی داواوە لەبری پەرتووك.
**case study,** لێکۆڵینەوەی ڕابوردوو و ژیاننامەی کەسێك یا تاقمێکی نموونەیی بۆ مەبەستی پزیشکی و دەروونی و کۆمەڵایەتی.
**casework** (kās′wûrk′), ***n.*** لێکۆڵینەوەی ژیاننامە: لێکۆڵینەوەی ڕابوردوو و دەوروبەری کەسێکی نەگونجاو و خێزانەکەی بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە کۆمەڵایەتییە.
**cash** (kash), ***n.*** پارە؛ پارەی ڕەق؛ پارەی دەستی؛ دراو.
***v.t.*** چەك گۆڕینەوە: *( I ~ed a check at the bank.)*.
***adj.*** بە پارەی ڕەق؛ بە پارەی دەستی نەك بە چەك: *( a ~ sale)*.
cash in, (١) گۆڕینەوە بە پارە؛ فرۆشتن و پارەکەی خستنە گیرفانەوە (پارە-بازی). (٢) [Slang]، مردن.
cash in on, (١) سوود لێ وەرگرتن. (٢) بەکەڵك هێنان بۆ سوودی خۆ؛ بەکارهێنان بۆ قازانجی خۆ:
*( He cashed in on his friendship with the prince.)*
**cashbook** (kash′book′), ***n.*** دەفتەری پارەی دەستی (کە داهات و

خەرجی پارەی ڕەقی بازرگانییەکی تێدا تۆمار دەکرێت).

**cashew** (kash′ōō, kə-shōō′), ***n.*** (١) داری کاشوو: درەختێکی هەمیشە سەوزە گوێزی " کاشوو " دەگرێت. (٢) کاشوو: بەرەدارێکی وەك گوێزی دوو فلیقانەی شێوە گورچیلەیی بۆرکارە ئەرەندەی دەنکە بادەمێك گەورەترە بە ووشك کراوەیی و بە کاڵی یا بە برژاوی و سوێرکراوی دەخورێت.

**cashier** (ka-shêr′), ***n.*** دەغیلەچی

**cashier** (ka-shêr′), ***v.t.*** (١) لە ئیش دەرکردن (بەتایبەتی بۆ سزادان)؛ لەسەر کار لابردن (٢) فڕێدان؛ نەویستن.

**cashier's check,** چەکێکە کە بانق لەسەر خۆی دەینووسێت.

**cashmere** (kash′mêr), ***n.*** ***Also*** **kashmir,** (١) مەرەزی کشمیر (٢) شاڵی کشمیر؛ جۆرە قوماشێکی خوری نەرمە. (٣) دەستماڵی کشمیری.

**cash on delivery,** [Abbr. C.O.D.; c.o.d.], پارەکەی یا نرخەکەی لەکاتی وەرگرتندا دەدرێت (شتێك کە دەنێررێتە ماڵەوە بۆ کڕیارەکەی).

**cash register,** دەغیلە.

**casing** (kās′iŋ), ***n.*** (١) بەرگ تێکرتن؛ دەورگرتن. (٢) (ا) بەرگ؛ کیف؛ توورەکە. (ب) ڕیخۆڵەی پاکراوەی ئاژەڵ (کە وەك توورەکە بەکاردێت) (٣) لاستیکی دەرەوەی پێچکەی ئوتومبیل. (٤) چوارچێوەی پەنجەرەو دەرگا.

**casino** (kə-sē′nō), ***n.*** (١) خانووچکەی هاوینەهەوار. (٢) قومارخانە؛ یانەی قومارو سەماو نوواندن. (٣) cassino.

**cask** (kask, käsk), ***n.*** (١) بەرمیلی شلەمەنی؛ بەرمیل. (٢) پڕ بەرمیلێك؛ بەرمیلێك.

**casket** (kas′kit, käs′kit), ***n.*** (١) سندووقی بچکۆلەی خشڵ و شتی تری بەنرخ. (٢) دارەمەیت.

**casque** (kask), ***n.*** = **helmet.**

**cassaba** (kə-sä′bə), ***n.*** = **casaba.**

**cassation** (ka-sā′shən), ***n.*** بەتاڵ کردنەوە (بڕیاری دادگا، هەڵبژاردن... هتد).

**casserole** (kas′ə-rōl′), ***n.*** (١) دفری شووشە یا گلێنی چێشت لێنان لە فڕندا (٢) چێشتێکی لێنراو لە دەفرێکی وەهادا. (٣) دەفرێکی دەسکداری قووڵە بۆ شت گەرم کردن (کیمیاگەری).

**cassette** (kə-set′), ***n.*** کاسێت: (ا) قوتووی شریتی مۆسیقاو فیلم. (ب) شریتەکە خۆی.

**cassimere** (kas′ə-mêr′), ***n.*** قوماشێکی خوری تەنکە

**cassino** (kə-sē′nō), ***n.*** جۆرە یارییەکی کاغەزە.

**cassock** (kas′ək), ***n.*** (١) جبەی قەشە. (٢) قەشەیی؛ پلەوپایەی قەشە. (٣) قەشە

**cassowary** (kas′ə-wer′i), ***n.*** باڵندەیەکە لە توخمی ووشترمەل بەڵام بچووکترە.

**cast** (kast, käst), ***v.t.*** (١) هاویشتن؛ هەڵدان؛ تێگرتن؛ فڕێدان: ***( ~ a stone)***
(٢) دان؛ دەنگدان (هەڵبژاردن): ***( I will ~ my vote for him.)***.
(٣) (ا) خستنە سەر (ڕووناکی)؛ لێدان؛ ئاراستەکردن: ***( This evldence may ~ some light on the crime.)***
(ب) سەیرکردن؛ چاو خستنە سەر:
(٤) هەڵدان؛ هاویشتن (تۆڕ، قولاپی ماسی، لەنگەر). (٥) هەڵدان (زاری تاوڵە).
(٦) بەر فڕێدان (گیاندار، ئافرەت)؛ بەراوێتە بوون.
(٧) کاژ فڕێدان؛ توێك فڕێدان؛ داکەندن: ***( The snake ~s its skin.)***.
(٨) بە زەویدا دان (زۆرانبازی). (٩) ژماردن؛ لێکدانەوە (ئزماو و بەرزاوی دەریا، بەخت لەڕێی ئەستێرەوانییەوە) . (١٠) ڕێکخستن؛ ڕێك وپێك کردن.
(١١) دارشتن؛ لە قاڵبدان.
(١٢) ئەکتەر هەڵبژاردن (شانۆگەری و فیلم): ***( to ~ a person in a role)***.
(١٣) خواروخێچ کردن؛ قوپاندن.

***v.i.*** (١) زار هەڵدان (یاری تاوڵە). (٢) هەڵدان (قولاپی ماسی)؛ هاویشتن.
(٣) ڕشانەوە. (٤) وەرگێڕان؛ خواروخێچ کردن؛ قوپاندن.
(٥) لێکدانەوە (ئزماو و بەرزاوی دەریا، بەخت لەڕێی ئەستێرەوانییەوە).
(٦) گۆترەکاری کردن؛ ڕەمڵ لێدان؛ وادانان.
(٧) نەخشەدانان؛ بیرلێکردنەوە.

***n.*** (١) هاویشتن؛ هەڵدان؛ فڕێدان. (٢) (ا) زار هەڵدان؛ مۆرە هەڵدان.
(ب) خاڵی مۆرەی هەڵدراو. (٣) بەخت؛ بەختەوەری؛ بەهات.
(٤) سەیرکردن. (٥) هەڵدانێکی قولاپی ماسی.
(٦) بە زەویدا دان (زۆرانبازی). (٧) لێکدانەوە؛ ژماردن.
(٨) نموونەیەکی بیروڕا یا توانای کەسێك.
(٩) شتێکی هەڵدراو (ددانی سەر قولاپی ماسی).
(١٠) شتێکی لە لەش فڕێدراو (پیسایی، ڕشانەوە). (١١) دارشتە؛ قاڵب.
(١٢) ئێسکبەند؛ گەچی گرتنەوەی ئێسقانی شکاو.
(١٣) دەستە ئەکتەری شانۆگەری یا فیلم: ***( to choose a ~ ; a good ~ )***.
(١٤) جۆر؛ شێوە؛ چۆنێتی. (١٥) خواری؛ لاری؛ وەرگەڕان.
(١٦) بەرەڵاکردنی سەگ و تانجی بۆ دۆزینەوەی نێچیر.

**cast about,** (١) بە دوادا گەڕان. (٢) نەخشەدانان.

**cast aside,** خستنە لاوە؛ فڕێدان؛ دەرکردن؛ دەست هەڵگرتن.

**cast away,** (١) خستنە لاوە؛ فڕێدان؛ نەویستن؛ دەرکردن. (٢) کەشتی شکاو و گیرخواردوو.

**cast down,** (١) شۆڕکردنەوە؛ خوارکردنەوە؛ چاو داخستن. (٢) پەست کردن؛ غەمبارکردن.

**cast in one's lot with,** چارەنووسی خۆ بەستن بە کەسێکی ترەوە.

**cast off,** (١) دەرکردن؛ فڕێدانە ئەولاوە؛ حاشالێکردن؛ دەست لێ هەڵگرتن. (٢) بەرەڵاکردن؛ ئازادکردن. (٣) هەڵکردنی لەنگەری کەشتی و پاڵ پێوەنانی بۆ دەرەوەی بەندەر. (٤) چنینی دوا ڕیزە تەقەڵ.

**cast one's ballot,** دەنگدان (هەڵبژاردن).

**cast out,** دەرکردن؛ پەڕەوازەکردن؛ تەرەکردن: ***( to cast a sinner out)***

**cast up,** (١) ڕشانەوە. (٢) بەرزکردنەوە؛ هەڵبڕین. (٣) سەرجەم کردن؛ کۆکردنەوە.

**castanets** (kas′tə-nets′, kas′tə-nets′), ***n.pl.*** پەنجەوانە؛ چەقەنە.

**castaway** (kast′ə-wā′, käst′ə-wā′), ***n.*** (١) ئاوارە؛ کەسێکی تەرەکراو یا پەڕەوازە. (٢) کەسێکی کەشتی شکاو؛ کەسێکی بارکەوتوو.

***adj.*** (١) ئاوارە؛ دەرکراو؛ تەرە؛ پەرەوازە. (٢) کەشتی شکاو؛ بارکەوتوو؛ چەقیو؛ گیرخواردوو.

**caste** (kast, käst), ***n.*** (١) یەکێك لە چینەکانی کۆمەڵ لە هیندستان. (کە هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ یەکتردا نەبوو). (٢) چین؛ دەستەی خۆ جیاڕاگر. (٣) چینایەتی؛ ڕژێمی چینایەتی؛ جیاوازی چینایەتی.

**lose caste,** پلەوپایەی کۆمەڵایەتی شکان.

**castellan** (kas′tə-lən), ***n.*** فەرماندەری قەڵا.

**caster** (kas′tẽr, käs′tẽr), ***n.*** (١) فڕێدەر؛ هاوێژەر. (٢) خوێدان؛ دەفری بچووکی ئاڵەت و سرکەو ڕۆنی سەر خوان. (٣) سینیای تیادانانی ئەم دەفرە بچووکانە لەسەر خوان. (٤) پێچکەی کورسی و قەنەفە.

**castigate** (kas′tə-gāt′), ***v.t.*** (١) بە توندوتیژی سەرزەنشت کردن یا ڕەخنەلێگرتن. (٢) سزادان؛ چەوساندنەوە.

-**castigation** ***(n.)***; **castigator** ***(n.)***.

**casting** (kas′tiŋ, käs′tiŋ), ***n.*** (١) فڕێدان؛ هاویشتن؛ هەڵدان. (٢) ئەکتەر هەڵبژاردن (بۆ شانۆگەری یا فیلم). (٣) دارشتە؛ قاڵب. (٤) شتی فڕێدراو (ڕشانەوە، پەڕی باڵندە، خۆڵی هەڵکەنراو لەلایەن جانەوەرەوە).

**casting vote ( or voice ),** دەنگی شت بە لایەکدا خەر یا یەکلایی-

کەرەوە (کە سەرزکی کۆر یا ئەنجوومەنێك دەیدات ئەگەر دەنگی هەردوولا هاوتا بوون).

**cast-iron** (kast′ī′ẽrn, käst′ī′ẽrn), ***adj.*** (١) لە ئاسنی جۆشدراو درووستکراوە. (٢) سەخت؛ قایم؛ جێر؛ بەهێز.

**cast iron,** ئاسنی جۆشدراو

**castle** (kas′'l, käs′'l), ***n.*** (١) قەڵا. (٢) خانوویەکی گەورەی وەك قەڵا. (٣) قەڵای شەترەنج.

***v.t.*** (١) خستنە قەڵاوە. (٢) جێ گۆڕکێ پێکردنی قەڵاو شا لە شەترەنجدا.

**castle in Spain,** زڕەخەو؛ خەیاڵ پلاوی؛ ئاواتی هەرگیز نەهاتەدی.

**castle in the air,** زڕەخەو؛ خەیاڵ پلاوی؛ ئاواتی هەرگیز نەهاتەدی.

**cast-off** (kast′ôf′, käst′ôf′), ***adj.*** فڕێدراو؛ دەرکراو؛ نەویستراو.

***n.*** (١) کەسێك یا شتێکی نەویستراو یا دەست لێ هەڵگیراو. (٢) بەندەر بەجێهێشتن (کەشتی).

**castor** (kas′tẽr, käs′tẽr), ***n.*** (١) [Rare]، گوڕهەڵکەنە. (٢) ڕۆنی گوڕهەڵکەنە. (٣) کڵاوی کەوڵی ڕێوی یا گوڕهەڵکەنە.

**castor bean,** (١) ڕووەکی ڕۆن گەرچەك. (٢) بەری ئەم ڕووەکە.

**castor oil,** ڕۆن گەرچەك.

**castrate** (kas′trāt), *v.t.* خەساندن.

**-castration** ***(n.).***

**casual** (kazh′ōō-əl), ***adj.*** (١) سەرپێیی؛ ڕێکەوت: ***(a ~ visit)*** . (٢) سەردەمی؛ ناهەمیشەیی:

***(A ~ worker is one without, regular employment.)***

(٣) لاسەرلایی

(٤) خاکی (حل‌وبەرگ)؛ سادە: ***(~ dress)*** .

***n.*** (١) کرێکارێکی سەردەمی؛ کەسێکی ڕێبوار. (٢) سەربازێك یا ئەفسەرێکە کە چاوەڕێی گواستنەوەیە بۆ ئۆردووگای هەمیشەیی

**casualty** (kazh′ōō-əl-ti, kazh′ool-ti), ***n.*** (١) کارەسات؛ لێقەومان. (٢) کوژراو و بریندار (جەنگ، کارەسات)؛ لێقەوماو؛ قوربانی:

***(the ~ies of war; The enemy suffered heavy ~ies.)***

**casuist** (kazh′ōō-ist), ***n.*** بڕیاردەری ناش و خراپی ڕەووشت (لەڕووی گاڵتەپێکردنەوە)؛ پاك‌وپیسکەر

**-casuistic** ***(adj.)***; casuistry ***(n.).***

**cat** (kat), ***n.*** (١) پشیلە. (٢) گیانداری تۆخمی پشیلە (وەك: شێر و پڵنگ). (٣) ژنی دەم پیس و ناپەسەند. (٤) جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە. (٥) قامچی. (٦) [Military Slang]، تراکتۆر. (٧) [Military Slang]، سەنگەرێکە کە بگوێزرێتەوە.

***v.t.*** (١) لەنگەر هەڵگرتن. (٢) بە قامچی لێدان.

**let the cat out of the bag,** نهێنی درکاندن؛ نهێنی ئاشکراکردن.

**cata-** (kat′ə), پێشگۆیەکە بەمانای: (أ) بەرەو قەوتان؛ بەرەو نەمان. (ب) بەتەواوی. (ج) دژ. (د) هەموو؛ بە هەموودا. (ه) بەرەو دوا؛ بە پێچەوانە.

**catabolism** (kə-tab′ə-liz′m), ***n.*** قەوتان یا ڕزینی ڕیشاڵ یا خانەی زیندوو

**catachresis** (kat′ə-krē′sis), ***n.*** بەکارهێنانی ووشە بە هەڵە.

**cataclysm** (kat′ə-kliz′m), ***n.*** (١) (أ) لافاو (ب) لافاوی خوێن. (٢) کارەساتێکی گەورەو وێرانکەر (لافاو، جەنگ، بوومەلەرزە)؛ گۆڕینێکی بنچینەیی و توندوتیژ؛ کارەساتی.

**cataclysmal** (kat′ə-kliz′m'l), ***adj.*** = **cataclysmic.**

**cataclysmic** (kat′ə-kliz′mik), ***adj.*** کارەساتی و بنچینەیی (ڕووداو، گۆڕین): ***(a ~ event)*** .

**catacomb** (kat′ə-kōm′), ***n.*** گۆڕستانی ژێرزەوی.

**catafalque** (kat′ə-falk′), ***n.*** چوارچێوەی دارتەرم لەسەر دانان (هی مردوویەکی بەناوبانگ بۆ بینینی لەلایەن خەڵکەوە پێش ناشتنی).

**catalepsis** (kat′ə-lep′sis), ***n.*** = **catalepsy.**

**catalepsy** (kat′ə-lep′si), ***n.*** بوورانەوەی سەردەمی (بەتایبەتی کاتی فێ لێهاتن).

-cataleptic ***(adj.).***

**catalog** (kat′'l-ôg′, kat′'l-og′), ***n.*** = **catalogue.**

**catalogue** (kat′'l-ôg′, kat′'l-og′), ***n.*** کەتەلۆگ؛ لیستەی شتومەك (هەندێ جار بە وێنەوە).

***v.t. & v.i.*** کەتەلۆگ کردن؛ خستنە کەتەلۆگەوە؛ لیستە بۆ کردن.

-cataloguer ***(n.)***; cataloguist ***(n.).***

**catalysis** (kə-tal′ə-sis), ***n.*** ڕاپەڕاندن یا هاندانی تێکەڵ بوونێکی کیمیایی (لەڕێی بەکارهێنانی ماددەی هاندەرەوە).

**catalyst** (kat′'l-ist), ***n.*** ماددەی ڕاپەڕێنەر یا هاندەر (کیمیاگەری)؛ بزوێنەر؛ هۆکار؛ ماددەی یاریدەدەر.

**catalytic** (kat′'l-it′ik), ***adj.*** بزوێنەری؛ هاندەری؛ ڕاپەڕێنەر.

***n.*** = **catalyst.**

**catalyze** (kat′'l-īz′), ***v.t.*** ڕاپەڕاندن یا هاندان (کیمیاگەری).

**catamaran** (kat′ə-mə-ran′), ***n.*** جۆرێکە لە بەلەمی با.

**catamenia** (kat′ə-mē′ni-ə), ***n.*** بێ نوێژی.

**catamite** (kat′ə-mīt′), ***n.*** حیز؛ گاندەر.

**catamount** (kat′ə-mount′), ***n.*** پشیلەکێوی؛ پڵنگ؛ وشەق.

**catamountain** (kat′ə-moun′t'n), ***n.*** = **catamount.**

**cataplasia** (kat′ə-plā′zhi-ə, kat′ə-plā′zi-ə), ***n.*** بۆ دواوە گەڕانەوەو گۆڕانی ڕیشاڵ بۆ باری ئاوڵەمەیی یا سەرەتایی (زیندەوەرزانی).

**catapult** (kat′ə-pult′), ***n.*** (١) مەنجەنیق: چەکێکی کۆنە وەك تۆپ. (٢) قۆچەقانی.

***v.t.*** تێگرتن؛ فڕێدان؛ هاویشتن؛ بەردو تۆپ تێگرتن.

**cataract** (kat′ə-rakt′), ***n.*** (١) تافگە؛ تافگەی گەورە؛ ڕێژاو. (٢) لافاو؛ لێشاو. (٣) تانە (نەخۆشی چاو).

**catarrh** (kə-tär′), ***n.*** هەڵامەتی زۆر چڵماوی.

**catastasis** (kə-tas′tə-sis), ***n.*** (١) گێروگرفت و پلەی پێش کارەساتی شانۆگەرییەك. (٢) پلەی هەرە بەرزی شانۆگەرییەك.

**catastrophe** (kə-tas′trə-fi), ***n.*** کارەسات؛ لێقەومان؛ کارەرەهات؛ کارەساتێکی زۆر ناخۆش.

**catastrophic** (kat′ə-strof′ik), ***adj.*** کارەساتی؛ نەهاتی؛ زۆر ناخۆش (لێقەومان): ***(a ~ event, illness, etc.)*** .

**catatonia** (kat′ə-tō′ni-ə), ***n.*** نەخۆشی ووشك بوونی سەردەمی لەش و توانای جووڵە نەمان و کاس بوون (پزیشکەوانی دەروونی).

-catatonic ***(adj.).***

**catcall** (kat′kôl′), ***n.*** (١) فیکەکێشان (بۆ نارەزایی دەربڕین)؛ هووها. (٢) قریوەقریو.

***v.t.*** فیکە لێ کێشان؛ هووها لێ کێشان.

***v.i.*** فیکەکێشان.

**catch** (kach), ***v.t.*** (١) گرتن: ***(to ~ a criminal)*** . (٢) گرتن بە تەڵە. (٣) کردن بە داوەوە؛ خەڵەتاندن. (٤) لەپڕ هاتن بەسەردا؛ گرتن: ***(to ~ someone red-handed)*** . (٥) لێدان؛ بەرکەوتن: ***(The blow caught him in the abdomen.)*** . (٦) پێدا گەیشتن؛ گرتنەوە: ***(He caught the train.)*** . (٧) گرتنەوە (بە دەست): ***(He caught a fast ball.)*** . (٨) چاوپێکەوتن: ***(~ his eye; ~ a glimpse of her)*** . (٩) گرتن (نەخۆشی)؛ تووش بوون؛ پێ گەیشتن: ***(He caught cold.)*** . (١٠) تێگەیشتن: ***(I didn't ~ what you said.)*** . (١١) دڵفڕاندن. (١٢) تۆپ گرتنەوە (یاری بێسبۆڵ).

***v.i.*** (١) گیران؛ پێوەبوون: ***(Her sleeve caught on a nail.)*** . (٢) ئاگرگرتن. (٣) تۆپ گرتنەوە (یاری بێسبۆڵ).

***n.*** (١) گرتن. (٢) گرتنەوە. (٣) (أ) چوکڵە؛ گرێ (زنجیری پاسکیل). (ب) گیرە.

(٤) گیراو (مرۆڤ، شت). (٥) سەرجەمی شتی گیراو یا ڕاوکراو (وەك ماسی).
(٦) کەسێك کە دەهێنێت دەست کەوێت (بۆ شووپێکردن یا هێنان):
*( That bachelor is a good ~ .)*
(٧) تۆپ فڕیدان و گرتنەوە.
(٨) دەنگ لەرزین یا بڕان (نەخۆشی).
(٩) گرتنەوەی تۆپ بە شێوەیەکی تایبەتی.
(١٠) [Colloq.]. مەرجی شاراوە؛ فێڵ: *( What's the ~ in his offer?)* .
***adj.*** (١) بەفریوبەر؛ هەڵخەڵەتێنەر؛ بە هەڵەدا بەر.
(٢) سەرنج ڕاکێش: *( a ~ phrase)* .
**catch at,** (١) پەلاماردان بۆ گرتن؛ هەوڵی گرتن دان.
(٢) بە پەرۆشەوە بوون بۆ؛ قۆستنەوە.
**catch it,** [Colloq.], سەرزەنشت کران؛ سزای خۆ وەرگرتن.
**catch on,** [Colloq.], (١) تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرچوون؛ فێربوون:
*( He's catching on.)*
(٢) بوون بە باو: *( The idea is catching on.)* .
**catch one's breath,** پشوودان؛ هەناسەیەك دان.
**catch up,** (١) قۆستنەوە؛ گرتنەوە؛ پەلاماردان.
(٢) پێ گەیشتنەوە؛ گرتنەوە؛ فریاکەوتن: *( I can't catch up with you because you're walking too fast.)*
(٣) هەڵە لێ گرتن. (٤) هووها لێ کێشان.
(٥) گرێدان؛ قوڵفەکردن.
**catchall** (kach′ôl′), ***n.*** (١) دەفر یا گەنجینەی هەمە جۆرە شت.
(٢) ووتەیەك یا پەیڕەوییەکی هەمووشت گرەوە.
**catcher** (kach′ẽr), ***n.*** (١) بگر (مرۆڤ، شت).
(٢) تۆپگرەوە (یاری بێسبۆڵ).
**catching** (kach′iŋ), ***adj.*** (١) درم؛ بەتەشەنە.
(٢) دڵفڕێن؛ جوان؛ سەرنج ڕاکێش.
**catchpenny** (kach′pen′i), ***n.*** هەرزانبەها
**catch phrase,** ووتەی سەرنج ڕاکێش؛ درووشم
**catchpole, catchpoll** (kach′pōl′), ***n.*** پۆلیسی قەرزارگر.
**catchup** (kach′əp, kech′əp), ***n.*** – **ketchup.**
**catchword** (kach′wũrd′), ***n.*** (١) ووشەی سەرنج ڕاکێش (وەك یەکەم ووشەو دوا ووشەی لاپەڕەی فەرهەنگێك کە لە لاسەرووی لاپەڕەکەوە دەنووسرێ). (٢) دروشم؛ ووتەیەکە کە ئەوەندە دەووترێتەوە سەرنج ڕادەکێشێت ودەبێتە دروشم. (٣) دوا ووتەی ئەکتەرێك (کە دوا بە دوایەوە نۆبەی ئەکتەری تر دێت).
**catchy** (kach′i), ***adj.*** (١) سەرنج ڕاکێش؛ جوان؛ دڵفڕێن.
(٢) بەئاسانی لەبیربوو؛ زوو باو سەند: *( a ~ tune)* .
(٣) بەفریوبەر؛ هەڵخەڵەتێنەر؛ بە هەڵەدا بەر.
(٤) پچڕپچڕ؛ ناوبەناو.
**cate** (kāt), ***n.*** [Archaic]. خواردنی خۆش
**catechesis** (kat′ə-kē′sis), ***n.*** فێرکردنی ئاین بە پرسیارو وەڵام.
**-catechetic; catechetical** ***(adj.).***
**catechism** (kat′ə-kiz′m), ***n.*** (١) ئامیلکەی فێرکردنی ئاین لەڕێی پرسیارو وەڵامەوە. (٢) ئامیلکەی فێرکردن بە پرسیارو وەڵام؛ پەیڕەونامە.
(٣) لێپرسینەوە؛ پرسیارلێکردن؛ لیستەی پرسیار.
(٤) بە زار فێرکردنی ئاین (وەك لە حوجرەدا).
**-catechist** ***(n.).***
**catechize, catechise** (kat′ə-kīz′), ***v.t.*** (١) فێرکردن لەڕێی پرسیارو وەڵامەوە (بەتایبەتی سەرەتای ئاین). (٢) بە ووردی پرسیارلێکردن.
**catechu** (kat′ə-choo̅′), ***n.*** *Also* **cashoo,** ماددەیەکی ڕەقە لە هەندێ درەخت دەردێت بۆ دەرمان و بۆیەو پێستە خۆشکردن بەکاردێت.
**catechumen** (kat′ə-kū′mən), ***n.*** (١) کەسێکی تازە وەرگەڕاو بۆ خاچ پەرستی کە بە زار سەرەتای ئەم ئاینە فێرکرابێت.
(٢) کەسێك کە بنچینەی باسێك بە زار فێرکرابێت.

**categorical** (kat′ə-gôr′i-k'l, kat′ə-gor′i-k'l), ***adj.*** (١) تەواو؛ بنەبڕ؛ بێ ئەملاو ئەولا: *( a ~ denial, statement, etc.)* .
(٢) بابەتی.
**category** (kat′ə-gôr′i, kat′ə-gō′ri), ***n.*** (١) بابەت؛ پۆل؛ شەقڵ؛ بەش. (٢) بەشێکی زانین (ژیربێژی).
**catena** (kə-tē′nə), ***n.*** زنجیرە.
**catenate** (kat′'n-āt′), ***v.t.*** کردن بە زنجیرە.
**-catenation** ***(n.).***
**cater** (kā′tẽr), ***v.i.*** (١) خواردەمەنی ئامادەکردن بۆ ئاهەنگێك بە پارە.
(٢) ( **~ to ; ~ for** )، هێنانەدی هەموو حەزو خواستێکی کەسێك یا کۆمەڵێك
**-caterer** ***(n.).***
**caterpillar** (kat′ẽr-pil′ẽr), ***n.*** (١) کرمی ئاوریشم؛ تەتەڵەمیران؛ کرمۆکەی پەپوولە. (٢) **caterpillar tractor** .
**caterpillar tractor,** تراکتۆر.
**caterwaul** (kat′ẽr-wôl′), ***v.i.*** میاواندن (نێرە پشیلەی بەناڵوش).
***n.*** میاوان.
**catfall** (kat′fôl′), ***n.*** زنجیر یا گوریسی لەنگەر بەرزکردنەوە.
**catfish** (kat′fish′), ***n.*** جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە.
**catgut** (kat′gut′), ***n.*** ژێ (کە لە ڕیخۆڵەی مەڕو ئەسپ درووست دەکرێت بۆ ئامێری مۆسیقا و نەشتەرگەری و ڕاکێتی تەنس).
**catharsis** (kə-thär′sis), ***n.*** (١) پاکردنەوەی ڕیخۆڵەو ئاوسك.
(٢) زاخاودانەوەی مێشك و هەست و دەروون (بە بینینی شانۆگەری و فیلم).
(ئەمە بەپێی بیروڕای فەیلەسوفی یۆنانی " ئەرستۆ " ) .
(٣) زاخاودانەوەی مێشك و هەست و دەروون (بە دەربڕینی هەست و نەست)
**cathartic** (kə-thär′tik), ***adj.*** پاکەرەوە (مێشك و هەست):
*( a ~ experience)*
***n.*** دەرمانی ڕەوانی.
**cathead** (kat′hed′), ***n.*** دار یا شیشە ئاسنی لەنگەر لەسەر هەڵکردن (بەبەردەمی کەشتییەوە).
**cathedra** (kə-thē′drə, kath′i-drə), ***n.*** (١) تەختی قەشە (لە کڵێسەیەکی گەورەدا). (٢) پلەی بەرز.
**cathedral** (kə-thē′drəl), ***n.*** (١) کڵێسەی سەرەکی ناوچەیەك.
(٢) کڵێسەی گەورەو جوان.
***adj.*** (١) وەك تەختی قەشە. (٢) فەرمانی؛ بڕواپێکراو.
(٣) تایبەتی بە کڵێسەی سەرەکی.
**catheter** (kath′ə-tẽr), ***n.*** بۆرییەکی باریکە بۆ دەرهێنان و چۆڕاندنەوەی شلە لە لەش (بەتایبەتی مین).
**catheterize** (kath′ə-tẽr-īz′), ***v.t.*** بۆری باریك خستنە لەشەوە بۆ دەرهێنان و چۆڕاندنەوەی شلە (بەتایبەتی مین).
**cathexis** (kə-thek′sis), ***n.*** بیروهۆش خستنە سەر کەسێك یا شتێك.
**cathode** (kath′ōd), ***n.*** (١) کاسۆد. (٢) جەمسەری سالب (پاتری).
**cathode rays,** تیشکی کاسۆد.
**catholic** (kath′ə-lik, kath′lik), ***adj.*** (١) گشتی؛ جیهانی؛ هەمەچەشنی. (٢) بیروڕا فراوان؛ کراوە: *( a ~ taste for literature)*
(٣) کاسۆلیکی؛ ئاینی کاسۆلیکی؛ کڵێسەی کاسۆلیکی؛ کڵێسەی خاچ پەرستی.
(٤) [C-]، تایبەتی بە کاسۆلیکی ڕۆما.
***n.*** (١) ئەندامی کڵێسەی خاچ پەرستی.
(٢) [C-]، ئەندامی کڵێسەی کاسۆلیکی ڕۆما.
**-catholically** ***(adv.).***
**Catholicism** (kə-thol′ə-siz'm), ***n.*** (١) ئاینی کاسۆلیکی.
(٢) [c-]، هەمەچەشنی؛ کراوە؛ فراوان (بیروڕا، هەڵوێست، هەست).
**catholicity** (kath′ə-lis′ə-ti), ***n.*** (١) گشتێتی؛ هەمەچەشنی.
(٢) کراوەیی؛ بیروڕا کراوەیی: *( a ~ of taste)* .
**catholicize** (kə-thol′ə-sīz′), ***v.t. & v.i.*** (١) مێشك فراوانکردن؛ بیروڕا فراوانکردن. (٢) وەرگەڕان بۆ ئاینی کاسۆلیکی.

**catholicon** (kə-thol′ə-kən), ***n.*** (١) دەرمانی هەموو نەخۆشی‌یەك؛ چاكەرەوە؛ هەموو نەخۆشی‌یەك چاكەرەوە (٢) هەمووشت گرەوە.

**catlike** (kat′līk′), ***adj.*** وەك پشیلە؛ بێ خشپە؛ بێ دەنگ.

**cat nap,** كەروێشكە خەو؛ سەرخەو.

**catnip** (kat′nip), ***n.*** ڕێحانە كێوی.

**cat's cradle,** یاری‌یەكی منداڵانەیە بریتی‌یە لە دەزوو پێچان بەدەوری پەنجەی كەسێكەوەو نەخشە لێ دروستكردنی

**cat's-eye** (kats′ī′), ***n.*** (١) چاوی پشیلە. بەردێكی بریقەداری بەنرخە. (٢) نیشانەیەكی بریقەدارە (وەك هی سەر پاسكیل‌و ڕێگەوبان... هتد).

**cat's-paw** (kats′pô′), ***n.*** (١) چرنووكی پشیلە؛ دەسكەلا؛ كەسێكی ساویلكەو بەكارهێنراو بۆ ئامانجی پیس. (٢) سرووەی سەرئاو.
(٣) قوڵفە؛ گرێ.

**catsup** (kat′səp, kech′əp), ***n.*** = **ketchup.**

**cattail** (kat′tāl′), ***n.*** ڕووەكێكی كەنارئاوە لە قەڕەم دەچێت.

**cattish** (kat′ish), ***adj.*** (١) پشیلانە؛ وەك پشیلە.
(٢) قیناوی؛ ڕق لەبەر.

**cattle** (kat′′l), ***n.*** (١) ڕەشەووڵاخ؛ گاوگۆتاڵ؛ ئاژەڵ.
(٢) جەماوەر (لەڕووی سووكی‌یەوە)؛ بۆرەپیاوان.

**cattleman** (kat′′l-mən), ***n.*** گاوان؛ خاوەن ڕەشەووڵاخ؛ گاوگۆتاڵدار.

**cattle-rancher** (kat′′l-ran′chēr), ***n.*** = **cattleman.**

**cattle-rustler** (kat′′l-rus′lēr), ***n.*** دزی ڕەشەووڵاخ

**catty** (kat′i), ***adj.*** (١) وەك پشیلە؛ بێ خشپە؛ بە دزی‌یەوە.
(٢) قیناوی؛ بە كینە ***( a ~ remark)***

**catwalk** (kat′wôk′), ***n.*** ڕێڕەوی تەسك (قەراغی پرد یا كەشتی).

**Caucasian** (kô-kā′zhən, kô-kash′ən), ***adj.*** (١) قەوقاری (گەل، كلتوور، زمان). (٢) تایبەتی بە ڕەگەزی سپی؛ ڕەگەزی سپی.
***n.*** (١) قەوقازی؛ كەسێكی قەوقازی
(٢) مرۆڤی سپی؛ ڕەگەزی سپی؛ سپی (ڕەگەز).
(٣) زمانەكانی ناوچەی قەوقاز.

**caucus** (kô′kəs), ***n.*** كۆڕ (بەتایبەتی هی دەستەی پەرلەمان‌و حیزب).
***v.i.*** كۆڕگرتن.

**caudad** (kô′dad), ***adv.*** بەرەو كلك (توێكاری، گیانەوەرناسی)؛ بەرەو قنگ؛ پاشەڵی

**caudal** (kô′d′l), ***adj.*** (١) لە نزیك قنگ یا كلكەوە؛ پاشەڵ
(٢) تایبەتی بە كلك

**caudate** (kô′dāt), ***adj.*** كلكدار

**caudex** (kô′deks), ***n.*** (١) قەدی دارخورما
(٢) بنی ڕووەكی چەند ساڵە.

**caudle** (kô′d′l), ***n.*** گۆشتاو یا شۆربا بە بەهارات‌و شەرابەوە بۆ نەخۆش

**caught** (kôt), *past tense and past participle of* catch.

**caul** (kôl), ***n.*** (١) (ا) پەردەی ناوڵەمە. (ب) بەشێكی ئەم پەردەیە كە هەندێك جار سەری ناوڵەمە دادەپۆشێت (گوایە نیشانەی باشی‌یە).
(٢) پەردەی نێوان گەدەو ڕیخۆڵە گەورە.

**cauldron** (kôl′drən), ***n.*** = **caldron.**

**cauliflower** (kô′lə-flou′ēr), ***n.*** قەرنابیت

**caulis** (kô′lis), ***n.*** قەد؛ لاسك

**caulk, calk** (kôk), ***v.t.*** (١) ئاوبڕكردن یا تكەبڕكردن بە هێلم.
(٢) درزگرتن یا پڕكردنەوە بە هێلم (دەرگا، پەنجەرە).

**caulker, calker** (kôk′ēr), ***n.*** (١) تكەبڕ (مرۆڤ)؛ درز پڕكەرەوە.
(٢) ئامێری هێلم لێدان؛ هێلم لێدەر.

**causal** (kôz′′l), ***adj.*** هۆیی
***n.*** ووشەی هۆ دەربڕ (وەك چونكە، لەبەرئەوەی... هتد).

**causality** (kô-zal′ə-ti), ***n.*** (١) هۆیی؛ پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام
(٢) هۆ؛ هۆكار

**causation** (kô-zā′shən), ***n.*** (١) هۆ؛ هۆكار. (٢) هۆكاری.
(٣) پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام.

**causative** (kôz′ə-tiv), ***adj.*** (١) بەكار؛ هۆیی.
(٢) پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام دەربڕ (ڕێزمان)؛ هۆ دەربڕ.

**cause** (kôz), ***n.*** (١) هۆ؛ بەڵگە.
(٢) مەسەلە: ***( He is fighting for a good ~ .)***
(٣) داوا (دادگا).
*v.t.* بوون بە هۆ: ***( What ~d his death?)*** .
**make common cause with,** لایەنگرتن؛ پشت گرتن.

**causeless** (kôz′lis), ***n.*** بەبێ هۆ؛ بەبێ بەڵگە.

**causerie** (kō′zə-rē′), ***n.*** (١) گفتوگۆ؛ ووتووێژ؛ دەمەتەقێ.
(٢) ووتارێكی كورت.

**causeway** (kôz′wā′), ***n.*** (١) ڕێگەوبانێكی بەرزە بەناو زۆنگاو یا بەسەر ئاودا؛ پرد. (٢) ڕێگەی قیرتاوكراو.
*v.t.* ڕێگەی بەرز دروستكردن (بەناو زۆنگاو یا بەسەر ئاودا)؛ پرد بۆ كردن.

**causey** (kô′zi), ***n.*** = **causeway.**

**caustic** (kôs′tik), ***adj.*** (١) تیژ (دەرمان، ماددەی كیمیایی).
(٢) بڕ (ووتە)؛ بریندارکەر؛ كوشندەو بە تەوسەوە: ***( a ~ remark)***
-caustically ***(adv.).***

**cauterize** (kô′tēr-īz′), ***v.t.*** سووتاندن (مێخەكە)؛ داخ كردن بۆ لێكدان (پزیشكەوانی).
-cauterization ***(n.).***

**cautery** (kô′tēr-i), ***n.*** (١) مێخەكە سووتێنەر (دەرمان، دەرزی).
(٢) مێخەكە سووتاندن؛ داخ كردن (پزیشكەوانی).

**caution** (kô′shən), ***n.*** (١) ووریایی؛ ئاگاداری:
***( When you cross a busy street, you should use ~ .)***
(٢) نیشانە یا ووتەی ووریاكەرەوە.
*v.t.* ووریاكردنەوە؛ ئاگاداركردنەوە؛ ئامۆژگاری كردن:
***( I ~ed him against being late.)***

**cautionary** (kô′shən-er′i), ***adj.*** ووریاكەرەوە: ***( ~ advice)*** .

**cautious** (kô′shəs), ***adj.*** ووریا؛ ووردبین؛ بە ئاگا:
***( a ~ investor, driver, etc.)***

**cavalcade** (kav′′l-kād′, kav′′l-kād′), ***n.*** دەستەی ئەسپ سوارو گالیسكە لە خۆنواندن یا ڕێوڕەسمێكدا.

**cavalero** (kav′ə-lā′rō), ***n.*** = **cavalier.**

**cavalier** (kav′ə-lêr′), ***n.*** (١) سوارچاكی چەكدار؛ ئەسپ سوار؛ سوارچاك. (٢) جوامێر. (٣) [C-]، لایەنگرێكی پاشای ئینگلتەرە " چارلس " ی یەكەم لە شەڕی براكوژیدا (١٦٤١–١٦٤٩ زاینی)؛ پاشاخواز.
*adj.* (١) بێباك؛ بێ دەربەست؛ لاسەرلایی؛ گوێنەدەر: ***( a ~ attitude)*** .
(٢) لووت بەرز؛ بەفیز؛ لەخۆبایی.
-cavalierly ***(adv. & adj.).***

**cavalla** (kə-val′ə), ***n.*** جۆرە ماسی‌یەكی ئەمەریكی‌یە.

**cavally** (kə-val′i), ***n.*** = **cavalla.**

**cavalry** (kav′′l-ri), ***n.*** هێزی سوارەی سوپا.

**cavalryman** (kav′′l-ri-mən), ***n.*** سەربازی سوارە؛ سوارە.

**cave** (kāv), ***n.*** ئەشكەوت.
*v.t.* ناو هەڵكۆڵین؛ بۆش كردن؛ ناو هەڵكەندن‌و دەرهێنان.
*v.i.* [Colloq.], هەرەس هێنان؛ ڕووخان؛ تەپین.
cave in, (١) هەرەس بردن؛ ڕووخان؛ تەپین:
***( The house caved in.)***
(٢) هەرەس پێ بردن؛ تەپاندن؛ ڕووخاندن.
(٣) [Colloq.]، خۆ بۆ ڕانەگیران؛ خۆ بەدەستەوەدان؛ ڕووخان (مرۆڤ):
***( He caved in under pressure.)***

**caveat** (kā′vi-at′), ***n.*** (١) ڕاگەیاندنێك لە كەسێكەوە بۆ دادگایەك كە بڕیار لەسەر داوایەك نەدرێت هەتا شایەتی ئەم وەردەگیرێت.

(۲) ووریاکردنەوە؛ ڕاگەیاندن؛ ئامۆژگاری.
**caveat emptor** (kā′vi-at′ emp′tôr), کڕیار ووریا بە (واتە ئەگەر ئەو شتەی دەیکڕێت خراپ دەرچوو لۆمەی کەس نەکەیت خۆت نەبێت).
**cave-in** (kāv′in′), *n.* (۱) هەرەس هێنان؛ تەپین؛ ڕووخان.
(۲) شوێنێکی هەرەس بردوو، تەپیو، یا ڕووخاو.
**cave man,** ئەشکەوت نشین؛ مرۆڤی کێوی.
**cavendish** (kav′ən-dish), *n.* گەڵا تووتنی پەستێنراوو وەك خەپلە لێکراو؛ بەستەکە توتن.
**cavern** (kav′ẽrn), *n.* (۱) ئەشکەوتی گەورە؛ ئەشکەوت.
(۲) بۆشاییەکی تاریك.
*v.t.* (۱) خستنە ئەشکەوتەوە.
(۲) ناو هەڵکۆڵین؛ بۆش کردن؛ ناو هەڵکەندن و دەرهێنان.
**cavernous** (kav′ẽr-nəs), *adj.* (۱) ئەشکەوتاوی؛ پڕ لە ئەشکەوت.
(۲) وەك ئەشکەوت (لە تاریکی و قووڵی و گەورەیی و نادیاریدا).
(۳) کون کون؛ کونیلەدار؛ پڕ کون و کەلەبەر.
(٤) قووڵ (چاو)؛ بە قووڵدا چوو: *( ~ eyes)* .
**caviar, caviare** (kav′i-är′, kä′vi-är′), *n.* کاڤیار: خۆراکێکە لە هێلکەی ماسی دروست دەکرێت.
**caviar to the general,** شتێکە بەرزترو بە بایەخترە لەوەی کە بۆرەپیاوان نرخی بزانن.
**cavicorn** (kav′i-kôrn′), *adj.* شاخ بۆش (گیانەوەرناسی).
**cavil** (kav′'l), *v.i. & v.t.* ( ~ at ; ~ about ), ڕەخنەی هیچ‌وپووچ گرتن؛ بەرپەرچ دانەوەی نابەجێ.
*n.* ڕەخنەی هیچ‌وپووچ؛ بەرپەرچ دانەوەی نابەجێ.
**-caviler; caviller** *(n.).*
**cavity** (kav′ə-ti), *n.* (۱) کون؛ بۆشایی؛ چاڵایی.
(۲) بۆشایی لەش: *( the abdominal ~ .; the body ~ies)* .
(۳) کلۆری (ددان)؛ کلۆر.
**cavort** (kə-vôrt′), *v.i.* (۱) جووتەلێدان بە هەواداو یاری کردن:
*( The horse ~ed.)*
(۲) ڕابواردن؛ کەیف کردن.
**caw** (kô), *n.* قاڕەقاڕ (قەلەڕەشکە)؛ قاڕە.
*v.i.* قاڕەقاڕکردن
**cay** (kā, kē), *n.* دوورگەیەکی بچووکی نزمی لمین یا شیلانییە؛ تیغەیەکی لمین یا شیلانی نزیك کەناردەریایە.
**cayenne pepper,** جۆرە ئاڵەتێکی سووری زۆر توونە (هەروەها پێی دەووترێ " cayenne " ، " red pepper " ).
**cayman** (kā′mən), *n. Also* caiman, تیمساحی ئەمەریکی.
**cease** (sēs), *v.t.* وەستاندن؛ بڕینەوە؛ دوایی پێ هێنان: *( to ~ fire)* .
*v.i.* وەستان؛ بڕانەوە؛ دوایی هاتن: *( All action ~d suddenly.)* .
*n.* وەستان: *( without ~ )* .
**ceasefire** (sēs′fīr′), *n.* شەڕ وەستان؛ شەڕ ڕاگرتنی سەردەمی.
**ceaseless** (sēs′lis), *adj.* بێ وەستان؛ بێ ووچان؛ بەردەوام.
**cecum** (sē′kəm), *n.* = caecum.
**cedar** (sē′dẽr), *n.* درەختی " ئەرز " (وەك هی لوبنان): درەختێکی هەمیشە سەوزە لە توخمی سنەوبەر.
**cedarbird** (sē′dẽr-bũrd′), *n.* باڵندەیەکی بچووکی پۆپنەداری ئەمەریکییە ئەوەندەی چۆلەکەیەك دەبێت.
**cedar waxing,** = cedarbird.
**cede** (sēd), *v.t.* (۱) دەست لێ هەڵگرتن (خاوەنێتی).
(۲) دان پێدانان؛ پێ لێنان.
**ceil** (sēl), *v.t.* (۱) سەرگرتن (خانوو، ژوور).
(۲) داپۆشین یا سواغدانی بنمیچ و دیوار.
**ceiling** (sēl′iŋ), *n.* (۱) بنمیچ؛ بنەبان.
(۲) ئەوپەر؛ پەڕی ئەوپەڕ: *( a ~ on prices, interest rates, etc.)* .

(۳) ئەوپەڕی بەرزی فڕۆکە.
**hit the ceiling,** [Slang], لەپڕ تووڕەبوون؛ شێتگیربوون.
**celebrant** (sel′ə-brənt), *n.* (۱) بەشداری ئاهەنگێکی ئاینی.
(۲) بەشداری ئاهەنگ. (۳) قەشەی ئاهەنگێری ئاینی لە کڵێسەدا.
**celebrate** (sel′ə-brāt′), *v.t.* (۱) ئاهەنگ و زەماوەند گێڕان.
(۲) یادکردنەوە بە ئاهەنگ و زەماوەند.
(۳) ستایش کردن؛ بانگ بۆدان؛ ڕێزلێنان. (٤) بڵاوکردنەوە.
*v.i.* (۱) یادکردنەوە بە ئاهەنگ. (۲) ئاهەنگی ئاینی گێڕان.
(۳) [Colloq.]، خۆش ڕابواردن؛ ئاهەنگ و زەماوەند گێڕان.
**celebrated** (sel′ə-brāt′id), *adj.* بەناوبانگ؛ ناسراو؛ ناودار:
*( a ~ writer, case, etc.)*
**celebration** (sel′ə-brā′shən), *n.* ئاهەنگ؛ ئاهەنگ و زەماوەند؛ یادکردنەوە.
**-celebrator** *(n.).*
**celebrity** (sə-leb′rə-ti), *n.* (۱) بەناوبانگ؛ بەناوبانگی؛ ناوداری.
(۲) کەسێکی بەناوبانگ یا زۆر ناسراو.
**celerity** (sə-ler′ə-ti), *n.* خێرایی؛ تیژڕەوی.
**celery** (sel′ẽr-i), *n.* کەرەووز؛ سەوزەیەکە لە توخمی کەرەووز لاسکەکەی ئەستوورەو دەخورێت.
**celesta** (sə-les′tə), *n.* ئامێرێکی مۆسیقاییە.
**celestial** (sə-les′chəl), *adj.* (۱) ئاسمانی. (۲) خودایی؛ پیرۆز.
(۳) [C-]، چینی؛ تایبەتی بە وولاتی چین.
*n.* (۱) بوونەوەرێکی ئاسمانی. (۲) [C-] ، کەسێکی چینی.
**celestial navigation,** کەشتیوانی و فڕۆکەوانی کردن بەهۆی ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکانەوە.
**celibacy** (sel′ə-bə-si), *n.* (۱) بێ ژن‌ومێردی؛ ڕەبەنی.
(۲) بێ ژن‌ومێردی لەبەر هۆی ئاینی (وەك قەشەی کاسۆلیکی).
**celibate** (sel′ə-bit, sel′ə-bāt′), *n.* (۱) کەسێکی بێ ژن و مێرد؛ کەسێکی ڕەبەن. (۲) کەسێکی ڕەبەن لەبەر هۆی ئاینی.
*adj.* (۱) بێ ژن و مێرد؛ ڕەبەن؛ سەڵت. (۲) ڕەبەن بەهۆی ئاینەوە.
**cell** (sel), *n.* (۱) خانە (زیندەوەرزانی). (۲) شانەی هەنگوین؛ خانە.
(۳) کوختەی قەڵەندەر. (٤) زیندان؛ ژووروۆچکەی زیندان.
(٥) بنکە؛ ڕێکخراوێکی بچووکی حیزبێك. (٦) خانەی پاتری.
**cella** (sel′ə), *n.* ناوجەرگەی پەرستگایەکی کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی.
**cellar** (sel′ẽr), *n.* (۱) سەرداب؛ ژێرزەمین؛ ژێرخان.
(۲) ژێرزەمینی شەراب؛ عەمباری ژێرخانی شەراب.
(۳) ئازووقەی شەراب: *( He keeps a good ~ .)* .
*v.t.* لە سەرداب یا ژێرزەمیندا هەڵگرتن.
**cellarage** (sel′ẽr-ij), *n.* (۱) سەرداب؛ ژێرزەمین؛ ژێرخان.
(۲) کرێی شت عەمبارکردن لە سەرداب‌دا.
**cellarer** (sel′ẽr-ẽr), *n.* کلیل بەدەستی ئازووقەی پەرستگا.
**cellaret** (sel′ẽr-et′), *n.* دۆڵابی شووشەی شەراب.
**cellist** (chel′ist), *n.* چێلۆژەن: کەسێکە ئامێرێکی مۆسیقایی کە پێی دەڵێن: " چێلۆ " لێدەدات.
**cello** (chel′ō), *n.* چێلۆ؛ کەمەنچە: ئامێرێکی مۆسیقاییە لە " کەمان " دەچێت، بەڵام زۆر گەورەترە.
**cellophane** (sel′ə-fān′), *n.* سێلۆفەین: پەڕەیەکی تەنکی ڕۆشنە خواردەمەنی پێ دەپێچرێتەوە.
**cellular** (sel′yoo-lẽr), *adj.* (۱) خانەیی؛ شانەیی.
(۲) لە خانە پێکهاتووە
**cellular phone,** *Also* cell phone, تەلەفۆنی دەستی.
**cellulate** (sel′yoo-lāt′), *adj.* = cellular.
*v.t.* خانە خانە کردن.
**cellule** (sel′ūl), *n.* خانەیەکی زۆر بچووك.
**cellulitis** (sel′yoo-lī′tis), *n.* هەوکردنی ڕیشاڵی خانەیی گیاندار.

**celluloid** (sel′yoo-loid′, sel′ə-loid′), *n.* سێلیولۆید باغە (کە فیلمی سینەما و شانەو شتی تری وەهای لێ دروووست دەکرێت).

**cellulose** (sel′yoo-lōs′), *n.* سیلولۆز ماددەیەکە دیواری خانەی پووەك و بەشی دارینی درەختی لێ پێکدێت.

**cellulous** (sel′yoo-ləs), *adj.* (١) زۆر خانەیی
(٢) لە خانە پێکهاتوو

**cell wall,** دیواری خانە

**celt** (selt), *n.* ئامێرێکی زۆر کۆنی بەردین یا کانزاییە وەك ئەسکەنەو تەور وایە

**Celt** (selt, kelt), *n. Also* Kelt, (١) سێلتی کەسێکە لە ڕەگەزی سێلتی کە لە کۆنەوە لە ئێرلەندەو ئوسکوتلەندەو وێلز دادەنیشن.
(٢) کەسێکە لە ڕەگەزی هیندۆ–ئەورووپی کۆن کە نیشتەجێی ئەورووپای ناوەڕاستو ڕۆژاوا بوون.

**Celtic** (sel′tik, kel′tik), *adj. Also* Keltic, سێلتی؛ تایبەتی بە ڕەگەزی " سێلت " و زمانو تایبەخۆو کلتوورەکەیان.
***n.*** زمانێکی هیندۆ–ئەورووپییە لە وێلزو ئوسکوتلەندەو ئێرلەندەو بەریتانیا کە ناوچەیەکی ڕۆژاوای فەرەنسایە قسەی پێ دەکرێت.

**cement** (sə-ment′), *n.* (١) چیمەنتۆ
(٢) شتی پێوەلکێنەر (وەك سرێش)
(٣) ماددەیەکی چیمەنتۆییە کلۆری ددانی پێ پڕ دەکرێتەوە.
(٤) پەیوەندی.
(٥) دیوارە ڕەقەکەی دیوی دەرەوەی ڕەگی ددان.
***v.t.*** (١) چیمەنتۆکردن؛ بە چیمەنتۆ قایم کردن یا پێکەوەنووساندن.
(٢) بەهێزکردن؛ پتەوکردن: ***( to ~ a relationship)*** .
***v.i.*** پێکەوەنووسان (وەك بە چیمەنتۆ)؛ پێکەوەلکان؛ قایم بوون؛ بەهێزبوون.

**cementation** (sē′mən-tā′shən, sem′ən-tā′shən), *n.* (١) چیمەنتۆکردن؛ چیمەنتۆکاری؛ بە چیمەنتۆ پێکەوەنووساندن.
(٢) تێوەدانی تۆزی خەڵووزی بەردین یا لم لە کانزایەکەوەو تواندنەوەیانو تێکەڵاوکردنیان لەگەڵ چیمەنتۆدا بۆ درووستکردنی شتی وەك فەخفووری.

**cementum** (sə-men′təm), *n.* دیوارە ڕەقەکەی دیوی دەرەوەی ڕەگی ددان

**cemetery** (sem′ə-ter′i), *n.* گۆڕستان؛ قەبرسان

**-cene** (sēn), پاشگرێکە بەمانای: تازە؛ نوێ

**cenobite** (sen′ə-bīt′, sē′nə-bīt′), *n.* نیشتەنی پەرستگا؛ فەقێ
**-cenobitic** ***(adj.)***; **cenobitism** ***(n.)***.

**cenotaph** (sen′ə-taf′), *n.* گۆڕی بەتاڵ گۆڕێك یا گوومەزێکە کە لەڕووی ڕێزەوە بۆ مردوویەك دەکرێت کە تەرمەکەی لە شوێنێکی تر نێژرابێت.

**cense** (sens), *v.t.* (١) بۆنی شوێنێك یا کەسێك خۆش کردن بە بخوور سووتاندن (٢) بخوور سووتاندن (بۆ خودایەك).

**censer** (sen′sẽr), *n.* شووشەی بخوور تێدا سووتاندن.

**censor** (sen′sẽr), *n.* (١) سەرژمێرو چاودێری ڕەووشت (لە ڕۆمای کۆن).
(٢) چاودێری ڕەووشتی جەماوەر.
(٣) چاودێری چاپەمەنیو فیلمو بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن (بۆ قەدەغەکردنی ناپەسەندەکانیان) (٤) ڕەخنەگر.
***v.t.*** چاودێری کردنی چاپەمەنیو فیلمو بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن لەلایەن میرییەوەو قەدەغەکردنی ناپەسەندەکانیان.
**-censorial** ***(adj.)***.

**censorious** (sen-sôr′i-əs, sen-sō′ri-əs), *adj.* ڕەخنەگر؛ هەمیشە کەموکووڕی دۆزەرەوە

**censorship** (sen′sẽr-ship′), *n.* چاودێری کردنو پشکنینی چاپەمەنیو پۆستەو فیلم لەلایەن میرییەوەو قەدەغەکردنی ئەوانەی دژ بە میری یا ڕەووشتن

**censurable** (sen′shẽr-ə-b′l), *adj.* سەرزەنشت دەمێنێت؛ لۆمە هەڵدەگرێت

**censure** (sen′shẽr), *n.* سەرزەنشت؛ لۆمە.
***v.t.*** سەرزەنشت کردن؛ لۆمەکردن

**census** (sen′səs), *n.* سەرژمێری دانیشتووان

**cent** (sent), *n.* (١) سەد (تەنها لە ووتەی لە سەددا " **per cent** " ) .
(٢) سەنت: سەدیەکی دۆلارێك.

**centaur** (sen′tôr), *n.* گیاندارێکی ئەفسانەییە سەرو سنگو پەلی مرۆڤی هەیەو لەشو لاقی ئەسپ (ئەفسانەی یۆنانی).

**centenarian** (sen′tə-nâr′i-ən), *adj.* سەد ساڵی؛ سەد ساڵە.
***n.*** کەسێکی سەد ساڵە.

**centenary** (sen′tə-ner′i, sen-ten′ə-ri), *n.* (١) سەدە؛ سەد ساڵ. (٢) سەد ساڵەیی؛ یادی سەد ساڵە.
***adj.*** (١) سەدەیی؛ سەد ساڵی. (٢) تایبەتی بە یادی سەد ساڵە.

**centennial** (sen-ten′i-əl), *adj.* (١) سەد ساڵی؛ هی سەد ساڵ.
(٢) هەر سەد ساڵ جارێك ڕوودەدات. (٣) سەد ساڵ؛ تەمەنی سەد ساڵە.
(٤) سەد ساڵ خایەن.
(٥) تایبەتی بە یادی سەد ساڵە: ***( The ~ celebration)*** .
***n.*** (١) یادی سەد ساڵە. (٢) ئاهەنگی یادی سەد ساڵە.
-centennially ***(adv.)***.

**center** (sen′tẽr), *n. Also* centre, (١) چەق؛ چەقی بازنە.
(٢) تەوەرە. (٣) مەڵبەند؛ بارەگا؛ بنکە. (٤) ناوچەق؛ ناوجەرگە.
(٥) ناوەند؛ ناوەڕاست. (٦) بازنەی دەوری نیشان (تیربازی).
(٧) ناوجەرگە: ***( Hollywood is the movie ~ .)*** .
(٨) یاریکەری ناوەڕاست (باسکە، فوتبۆڵی ئەمەریکی).
(٩) [C-]، حیزب یا ڕێکخراوێکی نێوانڕەو.
***v.i.*** لە ناوەڕاستدا بوون.
***v.t.*** (١) خستنە ناوەڕاستەوە؛ لە ناوەڕاستدا دانان.
(٢) کۆکردنەوە لە ناوەڕاستدا؛ کۆکردنەوە.

**center of gravity,** چەقی قورسایی.

**centerpiece** (sen′tẽr-pēs′), *n.* (١) گوڵدانێك یا شتێکی جوان کە خوانی سەرمێزی پێ دەڕازێنرێتەوە. (٢) بەشی هەرەگرنگ یا سەرەکی.

**centi-** (sen′ti), پێشگرێکە بەمانای: (١) سەد. (٢) سەدیەك.

**centigrade** (sen′tə-grād′), *adj.* سەنتیگرەید: (ا) سەدی؛ سەد پلەیی. (ب) تایبەتی بە گەرمی پێوی سەدی.

**centigrade thermometer,** گەرمی پێوی سەدی.

**centigram, centigramme** (sen′tə-gram′), *n.* سەنتیگرام: سەدیەکی گرامێك.

**centimeter, centimetre** (sen′tə-mē′tẽr), *n.* سەنتیمەتر: سەدیەکی مەترێك

**centipede** (sen′tə-pēd′), *n.* هەزارپێ.

**centner** (sent′nẽr), *n.* (١) سەنگێکی ئەورووپاییە بریتییە لە پەنجا کیلۆ. (٢) سەنگێکی سەد کیلۆییە.

**cento** (sen′tō), *n.* (١) بەرهەمێکی وێژەییە کە لە چەند سەرچاوەیەکەوە وەرگیرابێت. (٢) چێشتی مجەوەر؛ شتێکی هەمەجۆری نەگونجاو.
(٣) [Obs.]، پینەکاری.

**central** (sen′trəl), *adj.* (١) ناوجەرگەیی؛ ناوەندی؛ ناوەڕاستی.
(٢) سەرەکی؛ بنچینەیی؛ زۆر گرنگ.
-centrally ***(adv.)***.

**centralism** (sen′trəl-iz′m), *n.* کۆبوونەوەی دەسەڵاتی میری لە پایتەختدا.
-centralist ***(n.)***.

**centrality** (sen-tral′ə-ti), *n.* (١) ناوەڕاستێتی؛ ناوەندێتی.
(٢) نێوانڕەوخوازی؛ لە ناوەڕاستدا مانەوە.

**centralization** (sen′trəl-ə-zā′shən), *n.* (١) کۆکردنەوە لە ناوەڕاستدا؛ بەرەو ناوەڕاست بردن. (٢) کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتێکی میری لە یەك شوێن، لیژنە، یا فەرمانڕەوایدا؛ جڵەوگیری یەك شوێنی یا یەك کەسی؛ ناوەندێتی.

**centralize** (sen′trə-līz′), *v.t.* (١) كۆكردنەوە لە ناوەڕاستدا؛ كۆمەڵ پێ بەستن. (٢) خستنە ژێر یەك دەسەڵاتەوە؛ هێنانە ژێر یەك جڵەوگیری؛ ڕێكخستن و سەرەوكاری كردن لە یەك سەرچاوەوە.
*v.i.* لە ناوەڕاستدا كۆبوونەوە؛ لە ناوەڕاستدا كۆمەڵ بەستن.
**centre** (sen′tēr), *n., v.t. & v.i.*, = center.
**centric** (sen′trik), *adj. Also* centrical. (١) ناوەڕاستی. (٢) ناوچەقدار (٣) تایبەتی بە هەستەدەماری سەرچاوە.
-centrically *(adv.)*; centricity *(n.)*.
**centrifugal** (sen-trif′yoo-g'l), *adj.* (١) بەرەو دەرەوە بزواو. (٢) هێزی بۆ دەرەوە بزواو بەكارهێنەر. (٣) لە ناوەڕاستەوە بۆ دەرەوە گەشانەوە یا پەرەسەندن (گوڵ). (٤) دەماری خوێنبەر.
*n.* مەكینەی پاڵ پێوەنەر بۆ دەرەوە.
**centrifugal force,** هێزێكە كە شتی خولاوە پاڵ پێوە دەنێت دوور لە تەوەرەكەی خۆی.
**centrifuge** (sen′trə-fūj′), *n.* ئامێری شت لەیەك جیاكەرەوە (وەك جیاكردنەوەی شیر لە كەرەو چەوری).
*v.t.* شت لەیەك جیاكردنەوە بە ئامێرێكی وەها.
-centrifugation *(n.)*.
**centripetal** (sen-trip′ə-t'l), *adj.* (١) بەرەو ناوەڕاست بزواو. (٢) بەرەو ناوەوە گەورەبوون یا گەشانەوە (گوڵ)
**centripetal force,** هێزێكە كە شتی خولاوە پاڵ پێوە دەنێت بەرەو تەوەرەكەی.
**centrist** (sen′trist), *n.* ئەندامی حیزبێكی نێوانڕەو.
**centro-** (sen′trō, sen′trə), پێشگرێكە بەمانای: ناوەڕاست.
**centroid** (sen′troid), *n.* ناوەڕاست؛ ناوەڕاستی تۆپەڵ.
**centrum** (sen′trəm), *n.* (١) چەق؛ ناوجەرگە. (٢) قەدی بڕبڕە.
**centuple** (sen′too-p'l, sen-tōō′p'l, sen-tū′p'l), *adj.* سەد-ئەوەندە
*v.t.* سەد ئەوەندە زیادكردن؛ كردن بە سەد ئەوەندە.
**centuplicate** (sen-tōō′plə-kāt′, sen-tū′plə-kāt′), *v.t.* سەد ئەوەندە زیادكردن؛ سەد ئەوەندە كردن.
*adj. & n.* سەد ئەوەندە.
**centurial** (sen-tyoor′i-əl, sen-toor′i-əl), *adj.* سەدەیی؛ سەد ساڵی.
**centurion** (sen-tyoor′i-ən, sen-toor′i-ən), *n.* فەرماندەری سەد سەرباز (سوپای ڕۆمانی)
**century** (sen′chə-ri), *n.* سەدە؛ سەد ساڵ
**cephalad** (sef′ə-lad′), *adv.* بەرەو سەر یا پێشەوەی لەش (تونێكاری، زیندەوەرزانی)؛ سەروو پێشەوەی لەش.
**cephalic** (sə-fal′ik, se-fal′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە سەر یا مێشك؛ هی كەللە (٢) لەناو سەردایە؛ بە سەرەوەیە؛ لە نزیك سەرەوەیە.
**cephalo-, cephal-** (sef′ə-lō, sef′ə-lə), پێشگرێكە بەمانای: سەر؛ كەللە؛ مێشك.
**cephalometer** (sef′ə-lom′ə-tēr), *n.* سەرپێو؛ كەللەپێو.
**cephalothorax** (sef′ə-lə-thôr′aks, sef′ə-lə-thō′raks), *n.* سەرو سنگ پێكەوە: پێكەوەنووسانی سەرو سنگ لە هەندێك گیانداردا (وەك: جاڵجاڵۆكە، دووپشك، گیانداری قاوغداری وەك قرژاڵ).
**cephalous** (sef′ə-ləs), *adj.* سەر یا كەللەی هەیە.
**ceraceous** (si-rā′shəs), *adj.* مێوی؛ وەك مێو.
**ceramic** (sə-ram′ik), *adj.* سیرامیكی: تایبەتی بە گۆزەودیزەكاری
**ceramics** (sə-ram′iks), *n.pl.* (١) گلێنەكاری؛ گۆزەودیزەكاری. (٢) گۆزەودیزە؛ گلێنە؛ كاشی. (٣) خوێندنی گلێنەكاری؛ وانەیەك لە گلێنەكاریدا.
**ceramist** (ser′ə-mist), *n.* گۆزەودیزەكار؛ گلێنەكار.

**cerate** (sêr′āt), *n.* جۆرە مەلحەمێكە (چەوری و مێو و جەوی تێدایە).
**cerato-** (ser′ə-tō, ser′ə-tə), پێشگرێكە بەمانای: شاخ؛ قۆچ.
**ceratoid** (ser′ə-toid′), *adj.* وەك شاخ یا قۆچ (لە شێوەو ڕەقیدا).
**Cerberus** (sûr′bēr-əs), *n.* سەگێكی سێ سەرە پاسەوانی دۆزەخ دەكات (ئەفسانەی یۆنانی).
**cere** (sêr), *n.* چەرمی ژێر دەنووكی هەندێ باڵندە (وەك تووتی).
**cereal** (sêr′i-əl), *adj.* دانەوێڵەیی.
*n.* دانەوێڵە یا خواردەمەنییەكە تێكەڵاوی شیری سارد دەكرێت و بۆ بەرچایی دەخورێت.
**cerebellum** (ser′ə-bel′əm), *n.* مێشكۆڵە؛ مێشكە بچكۆلە.
**cerebral** (ser′ə-brəl, sə-rē′brəl), *adj.* (١) مێشكی. (٢) تەنها لە مێشكەوە هاتووە نەك لە هەستەوە.
**cerebral palsy,** ئیفلیجیی مێشك (كە لەپێش یا لەكاتی لەدایكبووندا تووش دەبێت و دەبێتە هۆی لەرزین و كرژبوون و بزوانی ماسولكە لەخۆیەوە و هەروەها بە باشی قسە بۆ نەكران).
**cerebrate** (ser′ə-brāt′), *v.i.* بیركردنەوە؛ مێشك بەكارهێنان.
-cerebration *(n.)*.
**cerebric** (ser′ə-brik, sə-rē′brik), *adj.* مێشكی.
**cerebritis** (ser′ə-brī′tis), *n.* هەوكردنی مێشك.
**cerebro-** (ser′ə-brō, ser′ə-brə), پێشگرێكە بەمانای: مێشك.
**cerebrospinal** (ser′ə-brō-spī′n'l), *adj.* تایبەتی بە مێشك و بڕبڕەی پشت.
**cerebrum** (ser′ə-brəm, sə-rē′brəm), *n.* مێشك.
**ceremonial** (ser′ə-mō′ni-əl, ser′ə-mō′nyəl), *adj.* (١) (أ) تایبەتی بە ئاهەنگ؛ ڕەسمی؛ تایبەتی بە كاروباری میری. (ب) هەر بەناو؛ ناكرێ: ***( a ~ position, office, etc.)*** .
*n.* ئاهەنگی ڕەسمی؛ نەریتی ئاینی یا كۆمەڵایەتی (شایی، خەتەنەسووران).
**ceremonious** (ser′ə-mō′ni-əs, ser′ə-mō′nyəs), *adj.* (١) تایبەتی بە ئاهەنگ: ***( a ~ welcome)*** . (٢) ڕەسمی؛ ڕێك‌وپێك و بەنەزاكەت و جوان. (٣) حەزكەر بە ئاسكی و ڕێك‌وپێكی و جوان نواندن.
**ceremony** (ser′ə-mō′ni), *n.* (١) ئاهەنگی ڕەسمی؛ ئاهەنگی بەڕێكردنی كاروباری میری. (٢) ئاهەنگی كۆمەڵایەتی و ئاینی و میری (شایی، خەتەنەسووران، بڕوانامە دان بە قوتابیان... هتد). (٣) نەریتی هیچ‌وپووچ و پەڕپووت.
**stand on ceremony,** زۆر گوێدان بە نەریتی هیچ‌وپووچ و پەڕپووت.
**cerise** (sə-rēz′, sə-rēs′), *n. & adj.* ئاڵ.
**cero** (sêr′ō), *n.* جۆرە ماسییەكی گەورەی دەریایە.
**cero-, cer-** (sêr′ə, ser′ə), پێشگرێكە بەمانای: مێو.
**cerotic acid,** ترشی سیرۆتیك (كە لە مێوی شانەی هەنگویندا هەیە).
**certain** (sûr′t'n, sûr′tin), *adj.* (١) تایبەتی؛ دیاریكراو؛ بڕاوە. (٢) مسۆگەر: ***( This is a ~ cure for the disease.)*** . (٣) دڵنیا؛ بێ گومان: ***( I am ~ of his innocence.)*** . (٤) تایبەتی؛ ناسراو؛ زانراو: ***( a ~ person; for a ~ reason)*** . (٥) هەندێ؛ ئەوتۆ؛ دیار: ***( to a ~ extent)*** .
for certain, بێ گومان.
**certainly** (sûr′t'n-li, sûr′tin-li), *adv.* (١) بێ گومان. (٢) بەڵێ؛ بێ گومان: ***( May I borrow your pen? C~ !)*** .
**certainty** (sûr′t'n-ti, sûr′tin-ti), *n.* (١) بێ گومانی؛ دڵنیایی؛ مسۆگەری. (٢) شتێك یا ڕووداوێكی بێ گومان.
of a certainty, [Archaic], بێ گومان.
**certes** (sûr′tēz), *adv.* [Archaic], بێ گومان؛ بە ڕاستی؛ تەواوە.
**certifiable** (sûr′tə-fī′ə-b'l), *adj.* شایەتی بۆ دەدرێت؛ گومانی لێ ناكرێت.
-certifiably *(adv.)*.

***n.*** شەمشەمەکوێرە.

**chirp** (chūrp), ***v.i.*** (١) خوێندن (باڵندە)؛ جریوەجریوکردن.
(٢) زیقەزیق کردن (مرۆڤ)

***n.*** جریوە؛ دەنگێکی وەك جریوە

**chirr** (chūr), ***n.*** خوێندنی هەندێ باڵندەو مێروو.

**chirrup** (chir′əp), ***n.*** (١) خوێندن (باڵندە).
(٢) دەنگ لە ئەسپ کردن و لێخوڕینی.

***n.*** دەنگی ئەسپ لێخوڕین.

**chirurgeon** (kī-rūr′jən), ***n.*** [Archaic]. پزیشکی نەشتەرگەر

**-chirurgical** ***(adj.).***

**chisel** (chiz′'l), ***n.*** ئەسکەنە.

***v.i. & v.t.*** (١) هەڵکەندن یا ڕێك وپێك کردن بە ئەسکەنە.
(٢) [Colloq.]. فێڵ کردن؛ قۆپیەکردن؛ دەستکەوتن بە ساختەو دەستبڕین.

**chiseled, chiselled** (chiz′'ld), ***adj.*** (١) بە ئەسکەنە هەڵکەنراوەو ڕێك وپێك کراوە (٢) ڕێك وپێك و جوان

**chiseler, chiseller** (chiz′'l-ēr, chiz′lēr), ***n.*** (١) ئەسکەنەچی.
(٢) [Colloq.]. کەسێکی ساختەچی یا دەستبڕ.

**chit** (chit), ***n.*** (١) منداڵ (٢) کچێکی بێ حەیا

**chit** (chit), ***n.*** [Chiefly British]. (١) نامە یا بیرخەرەوەیەکی کورت.
(٢) حسابی چێشتخانە یا مەیخانە.

**chitchat** (chit′chat′), ***n.*** قسە؛ دەمەتەقێ.

**chitter** (chit′ēr), ***v.i.*** (١) زیقەزیق کردن؛ جریوەجریو هاتن
(٢) [British Dial.]، لە سەرمادا لەرزین.

**chivalric** (shiv′'l-rik, shi-val′rik), ***adj.*** (١) سوارچاك؛ جوامێر
(٢) تایبەتی بە سوارچاکی

**chivalrous** (shiv′'l-rəs), ***adj.*** (١) سوارچاك؛ جوامێر.
(٢) تایبەتی بە سوارچاکی

**chivalry** (shiv′'l-ri), ***n.*** (١) سوارچاکی؛ جوامێری.
(٢) کۆمەڵێك سوارچاك یا جوامێر (٣) سیفەت یا تایبەخۆکانی سوارچاکێك وەك ئازایی، ڕێزگرتن لە خەڵك، زمان شیرینی، ڕەفتاری جوان، بەویژدانی، پاراستنی بێ دەسەڵاتەکان) (٤) نواندنی یەکێك لە تایبەخۆکانی پێشوو.
(٥) [Obs.] پلەی سوارچاکی.

**chive** (chīv), ***n.*** ڕیاری ڕەشکە سەوزەیەکە وەك تەرەپیاز وایە لە تام و ڕەنگدا بەڵام گەڵاکانی زۆر باریکترەو بچووکترە

**chlamys** (klā′mis, klam′is), ***n.*** پاڵتۆیەکی کورتە لە کۆندا لە یۆنان پیاوان لەبەریان دەکرد.

**chlor-** (klôr, klōr), = chloro-.

**chloral** (klôr′əl, klō′rəl), ***n.*** کلۆراڵ شلەیەکی بێ ڕەنگی چەوری ڕوونی بۆن تیژە

**chloral hydrate,** ئاوێتەیەکی کریستاڵی بێ ڕەنگە بۆ خەولێخستنی موگناتیسی بەکاردەهێنرێ.

**chloramine** (klôr′ə-mēn′, klōr-am′in), ***n.*** کلۆرامین ئاوێتەیەکە لە نایترۆجین و کلۆرین پێکدێت

**chloric** (klôr′ik, klō′rik), ***adj.*** کلۆریکی؛ کلۆریکی تێدایە

**chloric acid,** ترشی کلۆریك.

**chloride** (klôr′id, klō′rid), ***n.*** کلۆرید

**chlorinate** (klōr′ə-nāt′, klō′rə-nāt′), ***v.t.*** بە کلۆرین پاکردنەوە یا کلۆرین لێدان (ئاودەستخانە).

**chlorine** (klôr′ēn, klôr′in, klō′rēn, klō′rin), ***n.*** کلۆرین: کلۆر گازێکی زەردی سەوزباوی ژەهراوی بۆن ناخۆشە

**chlorite** (klôr′īt, klō′rīt), ***n.*** کلۆرایت

**chloro-** (klôr′ō, klôr′ə, klō′rō, klō′rə), پێشبەندێکە بەمانای (١) سەوز ***( chlorophyll)*** . (٢) کلۆر

**chloroform** (klôr′ə-fôrm′, klō′rə-fôrm′), ***n.*** کلۆرۆفۆرم: شلەیەکی بێ ڕەنگی زووهەڵچووە بۆ بەنج کردن و شت تواندنەوە بەکاردەهێنرێ.

***v.t.*** (١) بەنج کردن بە کلۆرۆفۆرم. (٢) کوشتن بە کلۆرۆفۆرم.

**chloromycetin** (klôr′ə-mī-sē′tin, klō′rə-mī-sē′tin), ***n.*** کلۆرۆمایسیتین: دەرمانێکی دژەتەنە.

**chlorophyll, chlorophyl** (klôr′ə-fil′, klō′rə-fil′), ***n.*** کلۆرۆفیل: ڕەنگی سەوزی ناو ڕووەك و داروردەخت

**chlorosis** (klə-rō′sis), ***n.*** (١) نەخۆشییەکی ڕووەکە بریتییە لە زەردبوونی گەڵاکانی بەهۆی کەمی تیشکی خۆر یا ئاسنەوە.
(٢) نەخۆشی کەم خوێنی تووشی کچان دەبێت لەکاتی باڵقیداو ڕەنگی پێست سەوز هەڵدەگەڕێ.

**chock** (chok), ***n.*** (١) خشتێك، بەردێك، یا مێخێکە کە دەخرێتە ژێر تایەی ئوتومبیلەوە بۆ ئەوەی نەجووڵێت (٢) پارچەیەك ئاسنە هەردوو سەری بۆ ناوەوە چەماوەتەوە پەتی پێ هەڵدەکرێ لەسەر پاپۆڕو بەلەم

***v.t.*** (١) مێخ لەبەردەمدا داکوتان؛ بەردەم گرتن بە پارچە دار یا بەرد
(٢) ئاسنی پەت هەڵکردن لەسەر بەلەم و پاپۆڕ.

***adv.*** لێوالێو؛ پڕ ***( a bin ~ full of potatoes)*** .

**chock-full** (chok′fool′), ***adj.*** لێوالێو؛ تەواو پڕە؛ پڕ.

**chocolate** (chôk′lit, chok′lit, chôk′ə-lit, chok′ə-lit), ***n.*** (١) چوکلێت: کاکاو. (٢) کێك، پۆدرە، یا شیلەی لە کاکاو دروستکراو (کە لە دەنکی کاکاوی هاڕراو دروست دەکرێ).
(٣) نوقوڵی کاکاو یا بە کاکاو داپۆشراو. (٤) ڕەنگی قاوەیی.

***adj.*** (١) لە کاکاو دروستکراو (٢) قاوەیی.

**choice** (chois), ***n.*** (١) هەڵبژاردن
(٢) چارە؛ مافی هەڵبژاردن: ***( I have no ~ in the matter.)***
(٣) هەڵبژێراو (مرۆڤ، شت): ***( He was my best ~ for leader.)***
(٤) باشترین بەش. (٥) کۆمەڵێك کە لێی هەڵدەبژێری.
(٦) بە وردی هەڵبژاردن (٧) هەڵبژاردە؛ نایاب: ***( ~ houses)*** .

***adj.*** هەڵبژاردە؛ نایاب

**choir** (kwīr), ***n.*** (١) دەستەی سروود خوێندن بە ئاوازەوەو گۆرانی وتن لە کڵێسەدا (٢) ئەو شوێنەی گۆرانی تێدا دەڵێن و سروود دەخوێننەوە بە ئاوازەوە. (٣) تیپی گۆرانی یا سەما.

***v.t. & v.i.*** [Poetic], خوێندنەوەی سروود بە ئاوازەوەو گۆرانی وتن لە کڵێسەدا.

**choirboy** (kwīr′boi′), ***n.*** کوڕێك کە لە تیپی گۆرانی و سروودی کڵێسەدایە

**choir loft,** باڵکۆنی تیپی سروودو گۆرانی وتن لە کڵێسەدا.

**choirmaster** (kwīr′mas′tēr, kwīr′mäs′tēr), ***n.*** سەرتیپی کۆرەسی گۆرانی یا سروود خوێندنەوە لە کڵێسەدا.

**choke** (chōk), ***v.t.*** (١) خنکاندن؛ تاساندن؛ هەناسە لێ بڕین.
(٢) بەرگرتن؛ گرتن؛ پەنگ پێ خواردنەوە.
(٣) ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتنی پەرەسەندن. (٤) پڕکردن.
(٥) هەوا لە کابرێتەر بڕین

***v.i.*** (١) خنکان؛ تاسان؛ هەناسە لێ بڕان.
(٢) ڕێ لێ گیران؛ گیران و پەنگ خواردنەوە

***n.*** (١) خنکان؛ تاسان؛ هەناسە لێ بڕان. (٢) دەنگی خنکان
(٣) هەوابڕی کابرێتەر؛ ئەو تۆڕەوانە یا دەمەوانەیەی کە ڕێگە لە چوونە ژوورەوەی هەوا دەگرێ بۆ ناو کابرێتەری مەکینەیەك کە بە بەنزین ئیش بکات
(٤) هاتنەوەیەك (لوولەی تفەنگ)

**choke back,** خۆگرتن (لەبەر گریان یا هەست پیشاندان)

**choke down,** بە گران بۆ قووتدان

**choke off,** کوژاندنەوە؛ دوایی پێ هێنان؛ هەناسە لێ بڕین

**choke up,** (١) خواردن هێنانەوە (بە کۆکین)
(٢) بەرگرتن؛ گیران (بۆری). (٣) نێجگار زۆر پڕکردن.
(٤) [Colloq.]، زمان بەستران یا وشك بوون بەهۆی خورپە یا قورگ بڕبوون لە گریانەوە (٥) [Colloq.]، وشك بوون و توانای کارکردن نەمان لە تەنگ وچەڵەمەیەکدا

**chokebore** (chōk′bôr′, chōk′bōr′), *n.* (١) لوونەی تفەنگ کە دینەودیەك یا تەسك دەبێتەوە لە نزیك سەری لوولەکەوە. (٢) تفەنگێك کە ئەم جۆرە لوولەیەی هەبێ.

**choker** (chōk′ẽr), *n.* (١) خنکێنەر (مرۆڤ، شت). (٢) ملوانکەیەك کە پڕ بە پڕی مل بێت. (٣) پارچەیەك فەروو کە دەکرێتە مل یا دەدرێ بەسەر شاندا؛ ملپێچ. (٤) [Colloq.]. بۆینباخێك یا یاخەیەکی پان.

**choking** (chōk′iŋ), *adj.* (١) خنکێنەر ***(a ~ gas)***. (٢) ناشر نابیستریٔ لەبەر قورگ پڕبوون لە گریان: ***(a ~ voice)***.

**chol-** (kol), = **cholo-**.

**chole-** (kol′i), = **cholo-**.

**choler** (kol′ẽr), *n.* توورەیی

**cholera** (kol′ẽr-ə), *n.* نەخۆشی کۆلیرا.

**cholera infantum,** کۆلیرا یا ڕشانەوەی مندالان

**choleric** (kol′ẽr-ik), *adj.* (١) توورەوتڕۆ؛ زووهەڵچوو. (٢) توورەکەر

**cholesterol** (kə-les′tə-rōl′), *n.* کۆلیسترۆل: ماددەیەکی چەورە لە ڕۆنی گیاندارو زەردێنەی هێلکەو خوێن و زراودا هەیە.

**cholo-** (kol′ō, kol′ə), پێشکۆیەکە بەمانای زراو؛ زەرداو

**choose** (chōōz), *v.t.* (١) هەڵبژاردن. (٢) بەلاوە باشتربوون؛ پەسەندکردن. (٣) ویستن؛ حەزکردن ***(~ to go)***.

***v.i.*** هەڵبژاردن

**cannot choose but,** ناچاربوون

**choosy** (chōōz′i), *adj.* ووردو بە سەرنج لە شت هەڵبژاردندا؛ بە ئاسانی ڕازی ناکرێ.

**chop** (chop), *v.t.* (١) داپاچین بە تەور یا تەوراس؛ لەتکردن؛ شکاندن یا برین (دار، درەخت). (٢) جنین؛ قاش کردن (پیاز). (٣) کورت کردنەوە. (٤) کەبسە لێدان بە توندی و دان بە زەویدا (وەرزش).

***v.i.*** (١) پیادان یا پیامالین (تەور، تەوراس، چەقۆ... هتد). (٢) لەپڕو بە جرتوفرتەوە جووڵانەوە.

***n.*** (١) داپاچین؛ برین؛ لەتکردن. (٢) لێدان؛ پیاکێشان. (٣) قاش؛ پارچە. (٤) پارچەیەك گۆشتی تەنك بە ئێسقانەکەوە (بەتایبەتی هی مەڕ یا بەران). (٥) پێستی هەڵقرچاو. (٦) شەپۆلێکی بچووك

**chop** (chop), *n.* (١) شەویلگە (٢) گۆنا؛ کوڵم؛ ڕوومەت

**chop** (chop), *v.t.* ئاڵوگۆڕکردن؛ گۆڕینەوە.

***v.i.*** لەپڕ ڕیبان گۆڕین، لادان، یا پێچکردنەوە (بەلەم یا پاپۆڕ بەهۆی باوە).

***n.*** ئاڵوگۆڕ؛ گۆڕینەوە.

**chop** (chop), *n.* (١) مۆر یا پوولی میری. (٢) نیشانەی سەر خواردەمەنی (کە باشی و خراپی پیشان دەدات). (٣) [Slang]. چۆنێتی؛ چەشن

**chopfallen** (chop′fôl′ən, chop′fôln′), *adj.* دڵتەنگ؛ غەمبار

**chophouse** (chop′hous′), *n.* چێشتخانەیەك کە هەر تەنها گۆشتی گاو مەڕو بەرازی تێدا لێ دەنرێت

**chopper** (chop′ẽr), *n.* (١) داپاچەر (مرۆڤ)؛ قاشکەر. (٢) پێکاری داپاچین (تەور، تەوراس، چەقۆ... هتد).

**choppy** (chop′i), *adj.* هەمیشەو لەپڕ دەگۆڕێ (با)

**choppy** (chop′i), *adj.* (١) هەڵساوەو پڕە لە شەپۆلی وورد (دەریا). (٢) ئاسەو هەبەرودابەزی زۆر تێدایە ***(a ~ ride, flight, etc.)*** (٣) قڵیشاو؛ هەڵقرچاو. (٤) پچرپچڕ (نووسین، دەنگ).

**chops** (chops), *n.pl.* (١) شەویلگەکان. (٢) دەمو لای خوارووی ڕوومەت.

**chopsticks** (chop′stiks′), *n.pl.* چیلکەی نانخواردن: دوو داری باریکی بچووکە چینییەکان خواردنی پێ دەخۆن لەباتی کەوچك و چەتاڵ.

**chop sucy,** خواردنێکی چینییە لە گۆشت و سەوزە پێکدێت و بە برنجەوە دەخورێت

**choragus** (kō-rā′gəs), *n.* (١) سەرۆکی تیپێکی شانۆگەری یۆنانی کۆن. (٢) سەرۆکی تیپ یا کۆرەسێکی مۆسیقاو گۆرانی.

**choral** (kôr′əl, kō′rəl), *adj.* تایبەتی بە کۆرەس یا تیپی سروودو گۆرانی کڵێسە؛ لەلایەن کۆرەس یا تیپی سروودو گۆرانی کڵێسەوە دەووترێ.

**choral, chorale** (kô-ral′, kə-ral′, kôr′əl), *n.* سروودێك کە وەك گۆرانی بە کۆمەڵ دەووترێ لەلایەن تیپی سروودو گۆرانی کڵێسەوە. هەروەها هەموو ئەوانەی کە لە کڵێسەکەدان.

**chord** (kôrd), *n.* (١) ژێ (ئامێری مۆسیقا)؛ تەل؛ شریت. (٢) ژێی بازنە (ئەندازە). (٣) گونجان (ئاوان). (٤) هەستی پەسەندکەر ***(His speech struck a sympathetic ~ .)***

**chord** (kôrd), *n.* ئاواز؛ چەند ئاوازێکی پێکەوە گونجاو.

***v.t. & v.i.*** ڕێکخستن (ئاوازی مۆسیقا)؛ گونجاندن (ئاوان)

**chore** (chôr, chōr), *n.* (١) (*pl.*)، ئەرکێکی ڕۆژانەی ڕۆتینی ناخۆش (وەك: هی ناومال، کێڵگە، یا کارگە). (٢) کارێکی ناخۆش.

**chorea** (kô-rē′ə, kō-rē′ə), *n.* نەخۆشییەکی دەمارە بە زۆری تووشی مندال دەبێ و دەبێ بە هۆی لەرزینی لەخۆوەی دەست، دەموچاو یا قاچ.

**choregraphy** (kə-reg′rə-fi), *n.* = **choreography.**

**choreographer** (kō′ri-og′rə-fẽr, kō′i-og′rə-fẽr), *n.* هونەرمەندێك کە سەمایەکی تایبەتی دابنێ بەتایبەتی سەمای بالێ.

**choreography** (kô′ri-og′rə-fi, kō′ri-og′rə-fi), *n.* (١) سەما (بەتایبەتی سەمای بالێ). (٢) هونەری دانانی سەمایەکی تایبەتی (بەتایبەتی هی سەمای بالێ).

**choric** (kôr′ik, kō′rik), *adj.* کۆرەسی؛ تایبەتی بە کۆرەس.

**chorine** (kôr′ēn, kō′rin), *n.* ئەندامی مێینەی کۆرەس.

**chorioid** (kôr′i-oid′, kō′ri-oid′), *adj. & n.* = **choroid.**

**chorion** (kôr′i-on′, kō′ri-on′), *n.* پەردەی مندال یا ئاوڵەمە.

**chorister** (kôr′is-tẽr, kor′is-tẽr), *n.* (١) ئەندامی تیپی سروودو گۆرانی کڵێسە بەتایبەتی کوڕ. (٢) سەرتیپی تیپی سروودو گۆرانی کڵێسە.

**chorography** (kô-rog′rə-fi, kō-rog′rə-fi), *n.* (١) هونەری دانانی نەخشە؛ نەخشەکێشان یا باسکردنی ناوچەیەك. (٢) نەخشە یا باسێکی وەها

**choroid** (kôr′oid, kō′roid), *adj.* تایبەتی بە پەردەی مندال.

**chorus** (kôr′əs, kō′rəs), *n.* (١) کۆرەس: دەستەیەك گۆرانی بێژو سەماکەر کە لە شانۆگەرییەکی کۆمیدی یا ئۆپەرایەکدا گۆرانی دەڵێن و سەما دەکەن. (٢) کۆمەڵێك خەڵك کە بە یەك دەنگ شتێك یا گۆرانییەك بڵێن (٣) ووتنی شتێك بە یەك دەنگ لەلایەن دەستەیەکەوە. (٤) ئەو شتەی کە بەم شێوەیە دەووترێ. (٥) لە شانۆگەری یۆنانی کۆندا ئەو دەستە ئەکتەرەی کە گۆرانی ووتنەکەیان و گفتوگۆکانیان گەلێك شتی ڕوون دەکردەوە دەربارەی شانۆگەرییەکە. (٦) ئەو ئەکتەرەی کە پێشەکی شانۆگەرییەك دەخوێنێتەوەو هەروەها پاش تەواوبوونی شانۆگەرییەکە ووتارێکی کورت دەخوێنێتەوەو هەردوو ووتارەکەش بەشێکن لە شانۆگەرییەکە (شانۆگەری ئینگلیزی سەدەی شانزەهەمو دواتر). (٧) ئەو ئاواز یا مۆسیقایەی دادەنرێ بۆ لێدان لەگەڵ گۆرانی ووتنی دەستەیەکدا (٨) بۆ سەندنەوە (گۆرانی).

***v.t. & v.i.*** گۆرانی ووتن یا سروود خوێندنەوە هەموو بەیەکەوەو بە یەك دەنگ

**in chorus,** هەموو پێکەوەو بە یەك دەنگ.

**chorus girl ( or boy ),** کچ (یا کوڕی) کۆرەس؛ ژنێك یا پیاوێکە کە گۆرانی دەڵێت یا سەما دەکات لە کۆرەسێکدا.

**chose** (chōz), *past tense of* **choose.**

**chose** (shōz), *n.* موڵکی تایبەتی (وەك شتومەکی ناومال، ئوتومبیل، ڕەشەووڵاخ... هتد).

**chosen** (chō′z′n), *adj.* (١) هەڵبژێراو؛ پەسەندکراو. (٢) خۆشەویستی خودا.

**chough** (chuf), *n.* قاژوو

**chow** (chou), *n.* (١) جۆرە سەگێکی مام ناوەندی تۆکمەی تووک درێژە
(٢) [Slang]. خواردەمەنی.
**chowchow** (chou′chou′), *n.* جۆرە ترشیاتێکە لە چەند جۆرە سەوزەیەك دروست دەکرێ.
*adj.* تێکەڵاو؛ هەمەچەشنە.
**chowder** (chou′dēr), *n.* شۆربایەکە نە ماسی یا گیانداری دەریایی ترو پەتاتەو شیر دروست دەکرێ.
**Christ** (krīst), *n.* مەسیح؛ عیسای کوڕی مەریەم
**christen** (kris′'n), *v.t.* (١) منداڵ پیرۆزکردن و بە مەسیحی کردنی.
(٢) ناونانی منداڵ بەم بۆنەیەوە؛ ناولێنانی پاپۆڕێکی تازە پێش ئەوەی بخرێتە گەڕ (٣) [Colloq.]. بەکارهێنان بۆ یەکەم جار.
**Christendom** (kris′'n-dəm), *n.* (١) هەموو مەسیحییەکان.
(٢) جیهانی مەسیحی
(٣) ئاینی مەسیحی؛ مەسیحایەتی.
**christening** (kris′'n-iŋ, kris′niŋ), *n.* پیرۆزکردن و ناونانی منداڵ و کردنی بە مەسیحی
**Christian** (kris′chən), *n.* (١) خاچ پەرست؛ مەسیحی
(٢) [Colloq.]. مرۆڤێکی باش.
*adj.* (١) خاچ پەرست (٢) تایبەتی بە مەسیح و ئامۆژگارییەکانی.
(٣) تایبەتی بە خاچ پەرستان و خاچ پەرستی.
(٤) [Colloq.]. باش (مرۆڤ)
**Christian Era,** چەرخی خاچ پەرستی (کە لە لەدایکبوونی مەسیحەوە دەست پێ دەکات)
**Christianity** (kris′chi-an′ə-ti), *n.* (١) خاچ پەرستێتی؛ ئاینی مەسیحی (٢) هەموو خاچ پەرستان
(٣) لقێکی خاچ پەرستی: *( Eastern C~ )*
(٤) ڕەووشت و کردەوەی خاچ پەرست.
**Christianize** (kris′chən-īz′), *v.t.* کردن بە خاچ پەرست.
*v.i.* بوون بە خاچ پەرست.
**Christianlike** (kris′chən-līk′), *adj.* خاچ پەرستانە؛ وەك خاچ پەرست.
**Christianly** (kris′chən-li), *adj. & adv.* وەك خاچ پەرست؛ خاچ پەرستانە
**Christian name,** ناوی خاچ پەرستی (کە لە منداڵ دەنرێ لە کاتی پیرۆزکردنی لە کڵێسەدا)؛ ناوی یەکەمی خاچ پەرست (بۆ جیاکردنەوەی لە نازناو
**Christian Science,** زانستی خاچ پەرستی ئاین و بیروباوەڕو ڕێبازێکی ژیانە لەسەر لێکدانەوەیەکی تایبەتی ئینجیل دانراوەو دەڵێت: نەخۆشی و بەدکاری چاری دەکرێ لەڕێی تێگەیشتنی ڕاستەقینەی ئامۆژگارییەکانی مەسیحەوەو لەڕێی ئاینی ڕاستەقینەوە نەك بە دەرمان و پزیشکەوانی
**Christian Scientist,** بڕواکەرێك بە زانستی خاچ پەرستی.
**Christless** (krīst′lis), *adj.* بێ بڕوا بە مەسیح؛ بێ ئاین.
**Christlike** (krīst′līk′), *adj.* وەك مەسیح (لە ڕەفتاردا).
**Christly** (krīst′li), *adj.* مەسیحییانە؛ وەك مەسیح.
**Christmas** (kris′məs), *n.* کریسمەس: جەژنی ساڵانەی لەدایکبوونی مەسیح کە ڕێکەوتی ٢٥ ی دیسەمبەرە.
**Christmas Day,** ڕۆژی ٢٥ ی دیسەمبەر.
**Christmas Eve,** ئێوارەی پێش ڕۆژی کریسمەس ( ٢٤ ی دیسەمبەر ).
**Christmastide** (kris′məs-tīd′), *n.* ماوە یا کاتی کریسمەس (کە لە ڕۆژی ٢٤ ی دیسەمبەرەوە دەگرێتەوە هەتا سەری ساڵی تازە یا ٦ ی کانوونی دووەم).
**Christmas tree,** داری کریسمەس: درەختێکی هەمیشە سەوزە مەسیحییەکان لە کاتی جەژنی کریسمەسدا لە ژووری میواندا دایدەنێن و بە گڵۆپ و شتی تر دەیڕازێننەوە

**chroma** (krō′mə), *n.* پاکی یا پوختی ڕەنگێك.
**chromatic** (krō-mat′ik), *adj.* (١) ڕەنگاوڕەنگ.
(٢) باش ڕەنگ دەگرێ.
**chromatics** (krō-mat′iks), *n.pl.* ڕەنگناسی.
**chromatin** (krō′mə-tin), *n.* ماددەیەکی پرۆتۆپلازمەییە لە ناووکی شانەی گیاندارو ڕووەکدا بە ئاسانی ڕەنگ دەگرێ.
**chromatism** (krō′mə-tiz'm), *n.* نەخۆشی زەردبوونی گەڵا.
**chromato-** (krō′mə-tō, krō′mə-tə), پێشبەندێکە بەمانای: ڕەنگ؛ پەڵە.
**chromatolysis** (krō′mə-tol′ə-sis), *n.* شیبوونەوە یا ڕزینی ماددەی پرۆتۆپلازمی ناو ناووکی شانەی گیاندارو ڕووەك کە بە ئاسانی ڕەنگ دەگرێ.
**chromatophore** (krō′mə-tə-fôr′, krō′mə-tə-fōr′), *n.* خانەی ڕەنگ دروستکەر لە ڕووەك یا گیانداردا.
**chrome** (krōm), *n.* (١) کرۆم: ماددەیەکی کانزایی کیمیایی سپی کریستاڵی زۆر ڕەقە نازرێت لە داڕشتەدا بەکاردەهێنرێ
(٢) ڕەنگی کرۆم (٣) داڕشتەیەکە کرۆمی تێدابێت.
**-chrome** (krōm), پاشبەندێکە بەمانای: ڕەنگ.
**chrome green,** سەوزی کرۆمی: ڕەنگێکی سەوزی قوڕقوشمەییە.
**chrome yellow,** زەردی کرۆمی: ڕەنگێکی زەردی قوڕقوشمەییە.
**chromic** (krō′mik), *adj.* کرۆمی؛ لە کرۆمەوە وەرگیراوە؛ بە کرۆم کراوە.
**chromium** (krō′mi-əm), *n.* کرۆم: ماددەیەکی کانزایی کیمیایی سپی کریستاڵی زۆر ڕەقە نازرێت لە داڕشتەدا بەکاردەهێنرێ.
**chromo-** (krō′mō, krō′mə), *Also* **chrom-**, پێشبەندێکە بەمانای: ڕەنگ؛ پەڵە.
**chromogen** (krō′mə-jən), *n.* ماددەی ڕەنگ پەیداکەر.
**chromosome** (krō′mə-sōm′), *n.* کرۆمۆسۆم: کەرتێکی- دەزوولەییە لە کەرت بوونی شانەی گیاندارو ڕووەك پەیدادەبێ و تایبەخۆی زگماکی لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ.
**chromosphere** (krō′mə-sfêr′), *n.* (١) ئەو چینە گازە سووربارو داگیرساوەی دەوروبەری خۆر کە لەکاتی خۆرگرتنی تەواودا دەبینرێ
(٢) چینێك گازی وەها لە دەوروبەری ئەستێرەیەکدا.
**chronic** (kron′ik), *adj.* (١) درێژخایەن؛ سەرهەڵدەرەوە (نەخۆشی) *( a ~ disease)*
(٢) خوویەك، نەریتێك یا نەخۆشییەك کە دەمێکە هەبووەو ئێستاش هەر ماوە: *( a ~ liar; a ~ smoker)*
(٣) هەمیشەیی.
**chronically** (kron′i-k'l-i, kron′ik-li), *adv.* هەمیشە.
**chronicle** (kron′i-k'l), *n.* (١) مێژوو.
(٢) تۆماری مێژوویی ڕووداوێك یا چەند ڕووداوێك بەگوێرەی ڕۆژو ساڵی ڕوودانیان.
*v.t.* نووسینەوەی مێژوو یا چیرۆکی شتێك یا ڕووداوێك؛ گێڕانەوەی مێژوو؛ تۆمارکردنی مێژووی ڕووداوێك
**chronicle play,** شانۆگەری مێژوویی.
**chronicler** (kron′i-klēr), *n.* مێژوونووس.
**chrono-** (kro′nō, kro′nə), *Also* **chron-**, پێشبەندێکە بەمانای: کات
**chronograph** (kron′ə-graf′, kron′ə-gräf′), *n.* کرۆنۆگراف: ئامێری پێوان و تۆمارکردنی کاتێکی کورت.
**chronologer** (krə-nol′ə-jēr), *n.* = chronologist.
**chronological** (kron′ə-loj′i-k'l), *adj.* (١) بەپێی کاتی ڕوودان (تۆمارنامەی ڕووداوێك). (٢) ڕێکخراو بەگوێرەی کاتی ڕوودان (تۆمارنامە یا مێژووی ڕووداوێك).
-chronologically *(adv.)*.

**chronologist** (krə-nol′ə-jist), ***n.*** پسپۆڕ یا تۆمارکەری ڕووداوەکان بەگوێرەی کاتی ڕوودانیان.
**chronology** (krə-nol′ə-ji), ***n.*** (١) لێکدانەوەو پێوانی کاتو چەسپاندنو ڕیزکردنی ڕووداوێك بەگوێرەی کاتی ڕوودانی؛ زنجیرەی مێژوویی. (٢) لیستە یا خشتەی بەرواری ڕووداوێك یا چەند ڕووداوێکی یەك لەدوای یەك.
**chronometer** (krə-nom′ə-tēr), ***n.*** ئامێری پێوانی کات
**-chronometric** ***(adj.)***; **chronometrical** ***(adj.)***; **chronometrically** ***(adv.)***.
**chronometry** (krə-nom′ə-tri), ***n.*** زانستی پێوانی کات
**chronoscope** (kron′ə-skōp′), ***n.*** ئامێری پێوانی ماوەی کاتی زۆر کورت
**chrysalis** (kris′'l-is), ***n.*** (١) پلەی نەبزووت: پلەی سێیەمی گۆڕینو گەورەبوونی مێروو کە هێشتا لە قوزاخەدایە. (٢) قوزاخەی مێروو. (٣) گیاندارێك یا شتێکی ساوا.
**chrysanthemum** (kris-an′thə-məm), ***n.*** داوودی (گوڵ
**chub** (chub), ***n.*** جۆرە ماسییەکی دەریاییە
**chubby** (chub′i), ***adj.*** خڕین؛ قەڵەو ***( ~ cheeks)*** .
**chuck** (chuk), ***v.t.*** (١) گوشین بە یارییەوە (بەتایبەتی ژێر چەناگە). (٢) هاویشتن. (٣) [Colloq.]، فڕێدان؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە. (٤) [Colloq.] ( ~ **out** ): بەزۆر دەرکردن.
***n.*** (١) گوشینێکی بە یارییەوە (بەتایبەتی ژێر چەناگە). (٢) هاویشتنێك. (٣) [Slang]، خواردەمەنی.
**chuck** (chuk), ***n.*** (١) گۆشتی لامل و سەرشانی ڕەشەوڵاخ. (٢) جۆرە قولاپێکە بۆ ڕاگرتنی ئامێرێك لە شوێنی خۆیدا.
**chuck** (chuk), ***v.i.*** قرتەقرت کردن (مریشك).
***n.*** قرتەقرتی مریشك
**chuck-full** (chuk′fool′), ***adj.*** = **chock-full.**
**chuckhole** (chuk′hōl′), ***n.*** چاڵ (ڕێگەوبان
**chuckle** (chuk′'l), ***v.i.*** (١) لەبەر خۆوە پێکەنین؛ پێکەنینی بێ دەنگ. (٢) قرتەقرت کردن (مریشك).
***n.*** لەبەر خۆوە پێکەنین؛ پێکەنینی بێ دەنگ.
**chuckle** (chuk′'l), ***adj.*** بێ مێشك؛ گەمژە؛ کەر
***n.*** کەسێکی گەمژەو بێ مێشك
**chucklehead** (chuk′'l-hed′), ***n.*** کەسێکی گەمژەو بێ مێشك
**-chuckleheaded** ***(adj.)***.
**chuck wagon,** واگۆنی خواردەمەنی: واگۆنێکە موبەقی تێدایە خواردنی تێدا دروست دەکرێ بۆ کرێکارانی کارگەیەك یا کێڵگەیەك.
**chuff** (chuf), ***n.*** کەسێکی نەزانو قسەڕەق؛ کەسێکی بێ نەزاکەت
**chug** (chug), ***n.*** دەنگی تەقینەوە (وەك هی مەکینەی شەمەندەفەر)
***v.i.*** (١) لێوەهاتنی دەنگی تەقینەوەیەکی وەها؛ تەقەتەق لێوەهاتن. (٢) تەقەتەق کردن بە ڕۆیشتنەوە: ***( The train ~ged along.)*** .
**chukar** (choo͞′kär′), ***n.*** کەو (باڵندە).
**chum** (chum), ***n.*** (١) برادەری نزیك؛ هاوڕێی گیانی بە گیانی. (٢) هاوخانە؛ هاوژوور.
***v.i.*** [Colloq.]. (١) نیشتەجێ بوون لە هەمان ژووردا لەگەڵ یەکێکی تردا. (٢) برادەرێتی لەگەڵدا کردن
**chum** (chum), ***n.*** دانە ماسی (بەتایبەتی لە ماسی چەور دەکرێو فڕێ دەدرێتە ناو ئاوەوە بۆ ڕاوەماسی).
**chummy** (chum′i), ***adj.*** گیانی بە گیانی؛ نزیك (برادەر)؛ برادەرانە
**chump** (chump), ***n.*** (١) سەر یا نووکێکی ئەستووری کول. (٢) [Colloq.]. کەسێکی گەوجو گەمژەو بێ مێشك
**chunk** (chuŋk), ***n.*** [Colloq.]. (١) پارچەیەکی کورتی ئەستوور (دار، گۆشت... هتد)؛ کوتە گۆشت؛ پلە گۆشت. (٢) بەشێك یا بڕێکی زۆر؛ هەندێکی زۆر. (٣) گیاندارێکی تۆکمەو قەڵەو.
**chunky** (chuŋk′i), ***adj.*** [Colloq.]. (١) کورتو ئەستوور (٢) پارچە پارچە.
**church** (chũrch), ***n.*** (١) کڵێسە؛ پەرستگای مەسیحییەکان. (٢) نوێژکردن؛ خواپەرستن. (٣) هەموو مەسیحییەکان. (٤) [C-]، لق یا شێوەیەکی تایبەتی کڵێسە: ***( The Methodist C~ ; C~ of England)*** (٥) دەسەڵاتی کڵێسەو ڕابەرانی. (٦) پیشەی ڕابەرانی کڵێسە. (٧) کۆمەڵێك نوێژکەر.
***v.t.*** دۆعا بۆ کردن (بەتایبەتی بۆ ژنی تازە منداڵ بوو).
***adj.*** تایبەتی بە کڵێسە: ***( ~ government)*** .
**churchgoer** (chũrch′gō′ēr), ***n.*** کەسێك کە هەمیشە دەچێ بۆ کڵێسە.
**churchless** (chũrch′lis), ***adj.*** (١) بێ کڵێسە؛ کڵێسەی تێدا نییە: ***( a ~ village, town, etc.)*** (٢) کەسێك کە نەچێ بۆ کڵێسە.
**churchman** (chũrch′mən), ***n.*** (١) قەشە. (٢) ئەندامی کڵێسە.
**Church of England,** کڵێسەی ئەنگلیکانی لە ئینگلتەرە (لە سەدەی شانزەدا لە کڵێسەی ڕۆما جیابووەوەو پاشای ئینگلتەرە خستییە ژێر دەستی خۆیەوە).
**Church of Rome,** کڵێسەی کاسۆلیکی ڕۆما.
**churchwarden** (chũrch′wôr′d'n), ***n.*** ڕابەری نائاینی کڵێسە (بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری نائاینی کڵێسە).
**churchyard** (chũrch′yärd′), ***n.*** حەوشەی کڵێسە (گەلێك جار هەندێکی دەکرێ بە گۆڕستان).
**churl** (chũrl), ***n.*** (١) لادێیی؛ دەشتەکی. (٢) کەسێکی نەزانو بێ نەزاکەت. (٣) ڕەزیل؛ پیسکە. (٤) لاسار؛ سەرکێش.
**churlish** (chũr′lish), ***adj.*** (١) لادێیی؛ دەشتەکی. (٢) بێ نەزاکەت. (٣) ڕەزیل؛ پیسکە. (٤) نایەتە ژێر ڕکێفەوە؛ جڵەوی ناگیرێ
**churn** (chũrn), ***n.*** (١) مەشکە. (٢) ژەنین.
***v.t.*** (١) مەشکە ژەنین؛ دۆ ژەنین. (٢) ڕاوەشاندن.
***v.i.*** (١) کەرە دروستکردن (بە ژەنینی ماست لە مەشکەدا). (٢) ژەنین؛ هاتنە جۆش.
**churning** (chũrn′iŋ), ***n.*** (١) ژەنین (مەشکە). (٢) ئەو کەرەیەی لە ژەنینی مەشکەیەکدا دەست دەکەوێ.
**churr** (chũr), ***n., v.i. & v.t.*** = **chirr.**
**chute** (sho͞ot), ***n.*** (١) تاڤگە؛ قەڵبەزە؛ خوڕاو. (٢) ئاوبارە، ڕاڕەو، جۆگە، یا بۆرییەکی لێژ (بۆ شت گواستنەوە): ***( a coal ~ ; laundry ~ )***
**chute, 'chute** (sho͞ot), ***n.*** [Colloq.], پەڕەشووت.
**chutney, chutnee** (chut′ni), ***n.*** عەنبە.
**cicatrix** (sik′ə-triks), ***n.*** (١) شوێن برین (پاش چاکبوونەوەی برینەکە). (٢) شوێنی ئەو برینەی دەمێنێتەوە لەدوای بڕینی لقە دارێك یا لێکردنەوەی گەڵایەك.
**cicerone** (sis′ə-rō′ni, chich′ə-rō′ni), ***n.*** ڕابەری گەشتیاران: ئەو کەسەی کە گەشتیاران دەبات بۆ شوێنی خۆشو مێژوویی وڵاتێكو باسی ئەو شوێنانەیان بۆ دەکات.
**Ciceronian** (sis′ə-rō′ni-ən), ***adj.*** ڕەوانبێژ؛ زمانپاراو.
**-cidal** (sīd′'l), پاشکۆیەکە بەمانای: بکوژ؛ کوشندە؛ لەناوبەر: ***( suicidal, homicidal)***
**-cide** (sīd), پاشکۆیەکە بەمانای: کوشتن؛ بکوژ: ***( suicide, homicide)***
**cider** (sī′dēr), ***n.*** خۆشاوی سێو؛ ئاوی سێو.
**cigar** (si-gär′), ***n.*** سیگار.
**cigarette, cigaret** (sig′ə-ret′, sig′ə-ret′), ***n.*** جگەرە.
**cigarette butt,** قنگە جگەرە.

**cigarette holder,** دارجگەرە
**cigarette-lighter,** چەرخ.
**cigarette-paper,** بەرماخ
**cilia** (sil′i-ə), ***n.*** (١) برژانگ (مرۆ). (٢) برژۆڵە (گەڵای درەخت).
**ciliary** (sil′i-er′i), ***adj.*** برژانگی؛ برژۆڵەیی.
**ciliate** (sil′i-it, sil′i-āt′), ***adj.*** برژۆڵەدار
***n.*** زیندەوەرێکی یەك خانەی بە میکرۆسکۆپ بینراو کە لەشی بە برژۆڵە داپۆشراوە.
**cimex** (sī′meks), ***n.*** مێرووی ناوجێگە
**cinch** (sinch), ***n.*** (١) تەنگە (زین، کورتان).
(٢) [Colloq.]، بە دەست گرتنێکی قایم.
(٣) [Slang]، مسۆگەر؛ شتێك کە کردنی یا دەستکەوتنی ئاسان و مسۆگەر بێ.
***v.t.*** (١) توندکردنەوەی تەنگەی ئەسپ.
(٢) [Slang]، دەست لێ گیربوونێکی باش و قایم؛ مسۆگەرکردن.
**cinchona** (sin-kō′nə), ***n.*** (١) درەختێکە توێکڵەکەی دەرمانی لێ دروست دەکرێ. (٢) توێکڵی تاڵی ئەم درەختە.
**cincture** (siŋk′chēr), ***n.*** (١) پشتێن.
(٢) شتێك کە چواردەوری شتێکی تری پێ دەگیرێ وەك ئەڵقەی دەوری پایەیەك؛ ئەڵقە
***v.t.*** چواردەورگرتن؛ دەورەدان.
**cinder** (sin′dēr), ***n.*** (١) پاشماوەی کانزا پاش تواندنەوەی لە کوورەدا.
(٢) ژیلەمۆی پاش تەقینەوەی ئاگرپژێن. (٣) سەرە بزووتك.
(٤) پشکۆ. (٥) (*pl.*)، ژیلەمۆ؛ خۆڵەمێش.
***v.t.*** سووتاندن؛ سووتاندن هەتا دەبێ بە سەرە بزووتك.
**cindery** (sin′dēr-i), ***adj.*** لە خۆڵەمێش یا ژیلەمۆ پێکهاتووە؛ خۆڵەمێشی؛ ژیلەمۆی تێدایە.
**cinema** (sin′ɔ-mə), ***n.*** (١) فیلمی سینەمایی.
(٢) سینەما. شوێنی پیشاندانی فیلم.
**the cinema,** (١) هونەر و دەرهێنانی فیلمی سینەمایی.
(٢) فیلمی سینەمایی بەگشتی.
**cinematic** (sin′ɔ-mat′ik), ***adj.*** سینەمایی
**-cinematically** ***(adv.).***
**cinematographer** (sin′ɔ-mə-tog′rə-fēr), ***n.*** وێنەگری فیلمی سینەمایی؛ دەرهێنەری فیلمی سینەمایی.
**cinematography** (sin′ɔ-mə-tog′rə-fi), ***n.*** هونەری وێنەگرتن و دەرهێنانی فیلمی سینەمایی
**cinerarium** (sin′ə-râr′i-ɔm), ***n.*** شوێنی هەڵگرتنی خۆڵەمێشی لاشەی سووتێنراو.
**cinerary** (sin′ə-rer′i), ***adj.*** (١) بۆنی خۆڵەمێشی لاشەی سووتێنراو
(٢) خۆڵەمێشی؛ بۆنی خۆڵەمێش.
**cinerator** (sin′ə-rā′tēr), ***n.*** کوورە یا تەنووری سووتاندنی لاشەی مردوو
**cinereous** (si-nêr′i-əs), ***adj.*** ڕەنگ خۆڵەمێشی؛ وەك خۆڵەمێش
**cingulum** (siŋ′gyoo-ləm), ***n.*** پشتێن؛ ئەڵقەی دەورەدراو؛ ئەڵقەی ڕەنگ.
**cinnamon** (sin′ə-mən), ***n.*** (١) دارچینی (٢) قاوەیی (ڕەنگ)
***adj.*** (١) قاوەیی (ڕەنگ). (٢) دارچینی تێکراوە؛ بە دارچینی کراوە یا لێنراوە.
**cinquecentist** (chiŋ′kwə-chen′tist), ***n.*** هونەرمەندێك یا نووسەرێکی ئیتاڵی سەدەی شانزەهەم.
**cinquecento** (chiŋ′kwə-chen′tō), ***n.*** (١) سەدەی شانزەهەم (بەتایبەتی لە هونەری ئیتاڵیدا). (٢) شێوازی هونەری ئیتاڵی لە سەدەی شانزەهەمدا.
**cinquefoil** (siŋk′foil′), ***n.*** (١) گوڵەباخێکی گەڵا پێنج پەڕەیی.
(٢) نەخشەیەکی پێنج کەوانەیی (خانووسازی).
**cion** (sī′ən), ***n.*** چووز؛ قەڵەم (ڕووەکناسی)؛ تووڵ؛ خەڵف؛ گۆیکەی پەیوەستکردن. (هەروەها دەنووسرێ: " scion ").
**cipher** (sī′fēr), ***n. Also*** **cypher,** (١) سفر؛ هیچ.
(٢) کەسێك یا شتێکی بێ بایەخ. (٣) پەرلە؛ شفرە.
(٤) کلیلی هەڵهێنان یا دەرکردنی شفرە.
(٥) نووسینێك کە خوێندنەوەی یا دەرکردنی گران بێ (بەتایبەتی هی ناو).
(٦) ژمارەیەکی عەرەبی.
***v.i.*** (١) لێکدانەوە (کێشەی بیرکاری). (٢) بە شفرە نووسین.
***v.t.*** (١) لێکدانەوە (کێشەی بیرکاری). (٢) نووسین بە شفرە.
**cipolin** (sip′ə-lin), ***n.*** مەرمەڕی ڕەنگاوڕەنگی ئیتاڵی.
**circa** (sūr′kə), ***prep.*** (Abbr. c., ca., cir., C.), نزیکەی (بەروار، مێژوو): ***( ~ 1650)*** .
**Circassian** (sēr-kash′i-ən, sēr-kash′ən), ***n.*** (١) شەرکەسی؛ هاوولاتییەکی شەرکاسیا. (٢) زمانی شەرکەسی.
***adj.*** شەرکەسی (زمان، گەل، کلتوور).
**circle** (sūr′k′l), ***n.*** (١) بازنە. (٢) کەمەرە. (٣) شتێکی خڕ یا بازنەیی.
(٤) خولگەی سووڕانەوەی ئەستێرەیەك.
(٥) دەستە (خەڵك)؛ کۆمەڵێك خەڵك کە هەمان سوود کۆی کردبنەوە؛ تاقم.
(٦) ناوچە. (٧) مەودا. (٨) بازنەی نەبینراوی زەوی.
(٩) ڕیزێك کورسی نیمچە بازنەیی لە تیاترۆیەکدا.
***v.t.*** (١) ئابلووقەدان؛ چواردەورگرتن؛ گەمارۆدان. (٢) خولانەوە؛ سووڕانەوە.
***v.i.*** خولانەوە؛ سووڕانەوە.
**circlet** (sūr′klit), ***n.*** (١) بازنەیەکی بچووك.
(٢) ئەڵقە؛ شتێکی بازنەیی کە بۆ جوانی بکرێتە دەست، مل، یا سەر.
**circuit** (sūr′kit), ***n.*** (١) کەمەرە؛ چێوە. (٢) ناوچەی ئەم کەمەرەیە.
(٣) سووڕانەوە؛ بەدەوردا خولانەوە: ***( the moon's ~ of the earth)***
(٤) هاتوچۆ (فەرمانبەر یا دادگەر... هتد).
(٥) ئەو ڕێگاوبانەی لەم هاتوچۆیانەدا دەبڕێت.
(٦) چەند هۆڵێکی شانۆگەری کە بەنۆرە فیلم یا شانۆگەری تێدا پیشان دەدرێ.
(٧) تەلی کارەبا (کە تەزووی کارەبای پێدا دەڕوات)؛ بازنەی کارەبایی
(٨) تەل؛ وایەر (ڕادیۆ).
***v.i.*** گەڕان؛ خولانەوە؛ سووڕانەوە.
***v.t.*** خولانەوە بەدەوردا؛ گەڕان بەدەوردا؛ سووڕانەوە بەدەوردا.
**circuit breaker,** ئامێری بڕینی تەزووی کارەبا (کاتێك تەزووی کارەبا زۆر دەبێ یا مەترسی لە تەلی کارەباکە دەکرێ).
**circuit court,** دادگایەکە کە بە نۆرە هەرجارەی لە شوێنێك یا شارێك دەبەسترێ.
**circuitous** (sēr-kū′i-təs), ***adj.*** ناڕاستەخۆ؛ بەپێچ‌وپەنا.
**circuit rider,** قەشەیەکی " مێسۆد " ی گەڕۆك.
**circuitry** (sūr′kit-ri), ***n.*** تەلی کارەبای پێکەوە بەستراو؛ تەلی کارەبای شوێنێك بەگشتی.
**circuity** (sēr-kū′i-ti), ***n.*** ناڕاستەوخۆیی؛ پێچ‌وپەنایی.
**circular** (sūr′kyoo-lēr), ***adj.*** (١) خڕ؛ بازنەیی.
(٢) دەخولێتەوە؛ دەسووڕێتەوە. (٣) ناڕاستەوخۆ؛ بە پێچ‌وپەنا.
(٤) بەناو گەلێك خەڵکدا بڵاودەکرێتەوە: ***( a ~ letter)*** .
***n.*** جاڕنامە، نامە، یا بڵاوکراوەیەك کە چاپ دەکرێ و بەناو گەلێك کەسدا بڵاودەکرێتەوە.
**circularity** (sūr′kyoo-lar′ɔ-ti), ***n.*** خڕێتی؛ بازنەییتی.
**circularize** (sūr′kyoo-lēr-iz′), ***v.t.*** (١) خڕکردن.
(٢) جاڕدان یا نامە بڵاوکردنەوە بەناو گەلێك کەسدا.
**circular saw,** مشاری خولاوە (کە بە کارەبا یا گاز کاردەکات).
**circulate** (sūr′kyoo-lāt′), ***v.i.*** (١) سووڕانەوە (خوێن)؛ خولانەوە؛ بڵاوبوونەوە لەم دەست بۆ ئەو دەست و لەم شوێن بۆ ئەو شوێن (پارە، قاو)؛ دەستاودەست کردن (پارە)؛ گەڕان (مرۆ). (٢) بڵاوبوونەوە بەناو هەندێ خەڵکی خوێندەواردا. (٣) دووپات بوونەوەی بێ پایانی ژمارە (بیرکاری)
***v.t.*** بڵاوکردنەوە (بەناو گەلێك کەس و شوێندا).

**circulating library,** کتێبخانەیەکە کە خوێنەر دەتوانێ کتێبی لێ بخوازی و پاش خوێندنەوەی بیگەڕێنێتەوە.

**circulation** (sûr´kyoo-lā´shən), *n.* (١) جوولان؛ سووڕان؛ بزووتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر (ئاوی ناو بۆری)؛ هەواگۆڕکێ. (٢) سووری خوێن (لەش). (٣) سووڕی شیلە (ڕووەك). (٤) بڵاوبوونەوە (دەنگوباس، پارە، قاو)؛ دەستاودەست کردن. (٥) بڵاوکردنەوە بەناو خوێندەواردا (ڕۆژنامە، گۆڤار... هتد). (٦) ڕادەی بڵاوکردنەوە یا بڵاوبوونەوە لە کاتێکی تایبەتیدا (ڕۆژنامە، گۆڤار):
*( The newspaper has a ~ of fifty thousand copies a day.)*

**circum-** (sûr´kəm, sēr-kum´), پێشەندێکە بەمانای: بەدەوریدا؛ بە هەر چوار دەوریدا: *( circumnavigate, circumscribe)*.

**circumambience** (sûr´kəm-am´bi-əns), *n.* چواردەوردان؛ ئابلووقەدان

**-circumambient** *(adj.).*

**circumambulate** (sûr´kəm-am´byoo-lāt´), *v.t. & v.i.* گەڕان؛ گەڕان بەدەوری شوێنێکدا

**circumcise** (sûr´kəm-sīz´), *v.t.* (١) خەتەنەکردن (٢) پاککردنەوە (لە خراپە یا زینا).

**circumcision** (sûr´kəm-sizh´ən), *n.* (١) خەتەنە؛ خەتەنەکردن. (٢) پاککردنەوە (لە خراپە یا زینا). (٣) [C-]، جەژنی خەتەنەکردنی مەسیح (یەکەم ڕۆژی ساڵی تازەی زایینییە).

**circumference** (sēr-kum´fēr-əns), *n.* (١) کەمەرە (بازنە)؛ چێوە. (٢) درێژی کەمەرە.

**circumflex** (sûr´kəm-fleks´), *n.* نیشانەیەکەی زمانەوانییە وەك: ( ˆ ، ˜ ، ˇ ) کە دەخرێتە سەر تیپە بزوێنی هەندێ زمان، وەك فەرەنسی (دەنگناسی)؛
*adj.* (١) نیشانەیەکی وەهای بەسەرەوەیە. (٢) چەماوە؛ چەماوەتەوە بەدەوریدا.
*v.t.* (١) چەمانەوە (٢) بێژانی تیپێك بەگوێرەی ئەم جۆرە نیشانانە.

**circumflexion** (sûr´kəm-flek´shən), *n.* چەمانەوە.

**circumfluent** (sēr-kum´floo-ənt), *adj.* بەدەوریدا دەڕوات (ئاو، ڕووبار)

**circumfluous** (sēr-kum´floo-əs), *adj.* (١) بەدەوریدا دەڕوات (ئاو، ڕووبار) (٢) دەوری بە ئاو گیراوە؛ ئاو دەورەیداوە.

**circumfuse** (sûr´kəm-fūz´), *v.t.* (١) ڕشتن یا بڵاوکردنەوەی شلەیەك بە چواردەوردا. (٢) دەورەدان بە ئاو یا شلەیەکی تر.

**-circumfusion** *(n.).*

**circumlocution** (sûr´kəm-lō-kū´shən), *n.* (١) درێژەپێدان (ووتار، قسەکردن، نووسین)؛ زۆر ڕێسان (ووتار، قسە، نووسین)؛ قسە جوینەوە؛ زۆر ڕۆیشتن لەسەر باسێك و درەنگ ئەنجام بەدەستەوەدان. (٢) مەبەست بەدەستەوە نەدان لە نووسین یا قسەکردندا (لەڕێی زۆر ڕێسانەوە). (٣) ووتەیەك یا دووانێکی درێژەپێدراو.

**circumnavigate** (sûr´kəm-nav´ə-gāt´), *v.t.* بە چوار دەوردا گەڕان بە پاپۆڕ یا بەلەم.

**-circumnavigation** *(n.)*; **circumnavigator** *(n.).*

**circumrotate** (sûr´kəm-rō´tāt), *v.i.* خولانەوە؛ سووڕانەوە (پێچکە)

**circumscribe** (sûr´kəm-skrīb´), *v.t.* (١) چواردەورگرتن؛ دەورەدان؛ سنوور بۆ دانان (٢) هێڵ کێشان بە چواردەوردا. (٣) کێشانی وێنەیەکی ئەندازەیی بەدەوری وێنەیەکی ئەندازەیی تردا بەمەرجێك لە زۆرترین شوێندا لەیەکتری بدەن:
*( to ~ a triangle with a circle)*

**circumscription** (sûr´kəm-skrip´shən), *n.* (١) دەورەدان؛ چواردەورگرتن. (٢) سنوور (٣) ماددەیەك کە چواردەوری شتێکی پێ بگیرێ. (٤) شوێنێکی سنوور بۆ دانراو یا چواردەور گیراو. (٥) نووسراوێکی بازنەیی کە هەڵکەنرابێ لەسەر پارە یا مەدالیایەك.

**circumspect** (sûr´kəm-spekt´), *adj.* وریا؛ هۆشمەند؛ دووربین.

**circumspection** (sûr´kəm-spek´shən), *n.* وریایی؛ دووربینی؛ هۆشمەندی.

**circumstance** (sûr´kəm-stans´), *n.* (١) بار؛ دۆخ؛ هەلومەرج (٢) (*pl.*)، باری دارایی *( They are in comfortable ~s.)*. (٣) خۆنواندن؛ کەشوفش: *( pomp and ~ )*. (٤) وردەکاری؛ ووردی *( The story was told with great ~ .)*.
*v.t.* خستنە بارێکی تایبەتییەوە.
under no circumstances, بە هیچ جۆرێك؛ هەرگیز
under the circumstances, لەم بارەدا؛ لەم هەلومەرجەدا.

**circumstantial** (sûr´kəm-stan´shəl), *adj.* (١) پەیوەندی هەیە یا دەکەوێتە سەر بارێکی تایبەتی. (٢) ناگرنگ؛ ڕێکەوتە. (٣) وورد؛ دوورودرێژ.

**circumstantial evidence,** بەڵگەیەك کە پەیوەندی هەبێ بە کێشەیەك یا داوایەکەوە (دادگا):
*( Proof of possession of stolen property is ~ in case of theft.)*

**circumstantiate** (sûr´kəm-stan´shi-āt´), *v.t.* بەڵگە هێنانەوە یا پیشاندان بۆ پشتگیری کردنی هەڵوێستێك؛ سەلماندن یا ساغ کردنەوە بە بەڵگە

**-circumstantiation** *(n.).*

**circumvallate** (sûr´kəm-val´āt), *v.t.* دەورگرتن بە دیوار یا خەندەق (بۆ پاراستن لە دوژمن).
*adj.* دەور گیراو (بە دیوار یا خەندەق).

**circumvent** (sûr´kəm-vent´), *v.t.* (١) بە دەوردا ڕۆیشتن (بۆ- نەگیران و دەربازبوون)؛ جێبەجێنەکردنی کارێك یا گەیشتن بە ئامانج لەڕێی فێڵوتەڵەکەو خۆ نەدان بەدەستەوە و لەلاوە شت کردن نەك ڕووبەڕوو (٢) چواردەورگرتن بە فێڵوتەڵەکە. (٣) بە تەڵەوە کردن؛ داو بۆ نانەوە (٤) لەخشتەبردن؛ بەزاندن بە زۆرزانی و فێڵبازی. (٥) تەگەرە خستنە بەردەم؛ ڕێگەلێگرتن؛ بوون بە کۆسپ لە ڕێگەدا

**-circumvention** *(n.)*; **circumventive** *(adj.).*

**circumvolution** (sûr´kəm-və-loo´shən), *n.* (١) پێچ خواردن بە دەوردا؛ پەیکە خواردن. (٢) پێچ؛ پێچێك (٣) ڕێگەی پێچاوپێچ؛ شێوەی پێچ پێچاوی.

**circus** (sûr´kəs), *n.* (١) تەلان یا جێی پلەپلەکراوی ڕۆمانی (کە وەرزش و پێشبڕکێ و زۆرانبازی تێدا دەکرا)؛ مەیدان (٢) سێرك (٣) خۆنواندنی سێرك (٤) چواڕێیانێکی خڕی کراوە. (٥) [Colloq.]، کەسێك یا شتێکی قۆشمەو خۆنوێنەرو سەماگێر.

**cirque** (sûrk), *n.* (١) شوێنێکی خڕ یا بازنەیی. (٢) [Poetic]، بازنە؛ ئەلقە. (٣) [Archaic]، سێرك. (٤) تەلانێکی سرووشتی لە شاخێکدا.

**cirrhosis** (si-rō´sis), *n.* نەخۆشی جگەر: نەخۆشییەکی درێژخایەنی جگەرە بریتییە لە پەیدابوونی چەند تێشوویەك لە دەوروبەری جگەرو لە ئەنجامدا داخستنی ئەو دەمارەی کە خوێن دێنێ بۆ جگەر بۆ پاککردنەوەی وە دەبێتە هۆی مردن.

**-cirrhotic** *(adj.).*

**cirrus** (sir´əs), *n.* (١) تەرزی پیاهەڵگەڕان (ڕووەك) (٢) هەورێکی تەنکی زۆر بەرز.

**cis-** (sis), پێشبەندێکە بەمانای: (١) لەم بەر. (٢) لەدوای ئەوە؛ لە ئەنجامدا

**cisatlantic** (sis´ət-lan´tik), *adj.* لەم بەری ئۆقیانووسی ئەتڵەسی

**cist** (sist), *n.* (١) گۆڕی بەردین (چەرخی کۆن). (٢) سنووقی هەڵگرتنی دەفری پیرۆز (لە خۆپیشاندانی یۆنان لە کۆندا)

**cistern** (sis´tērn), *n.* (١) عەمباراو؛ ئەستێرك؛ ئەستێل (بەتایبەتی کە باراناوی تێدا کۆدەبێتەوە) (٢) توورەکە یا بۆشایی لەش (کە شەیەکی تێدایە).

**cisterna** (sis-tûr´nə), *n.* توورەکە یا بۆشایی ناولەش (کە شلەیەکی

تێدایە).

**citadel** (sit′ə-d'l, sit′ə-del′), *n.* (١) قەڵا؛ قەڵایەکە بە شوێنێکی بەرزەوە. (٢) پەنا (٣) ئەو شوێنەی تۆپ و تفەنگی تێدا دابەستراوە لە پاپۆڕێکی جەنگیدا.

**citation** (sī-tā′shən), *n.* (١) بانگ کردن (دادگا)؛ وەرگرتنی ژمارەی ئوتومبیل و سزادانی (لەلایەن پۆلیسەوە). (٢) وەرگرتن؛ بە بەڵگە هێنانەوە. (٣) وەرگێراو (٤) ناوهێنان لە ڕاپۆرتێکی میریدا (بۆ ئازایی یا زیرەکی... هتد). (٥) ناوهێنان بۆ کردن بە بەڵگە (یاسایەک یا کێشەیەکی دادگایی ڕابوردوو).

**cite** (sīt), *v.t.* (١) بانگ کردن بۆ دادگا. (٢) بانگ کردن بۆ جووڵانەوەیەک. (٣) وەرگرتن: لێ وەرگرتن (٤) ناوبردن (بۆ بەڵگە، ڕوونکردنەوە یا نموونە). (٥) ناوبردن لە ڕاپۆرتێکی میریدا (بۆ ئازایی یا خزمەت کردن لە سوپادا).

**cithara** (sith′ə-rə), *n.* قیسارە: ئامێرێکی مۆسیقایی کۆنە.

**cither** (sith′ẽr), *n.* = **cithara.**

**cithern** (sith′ẽrn), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی ژێداری سەدەی شانزەهەمە لە گیتار دەچێ.

**citied** (sit′id), *adj.* (١) شاری لەسەرە؛ بە شار ئاوەدان کراوەتەوە *( The ~ earth)* (٢) شاری؛ وەک شار

**citified** (sit′i-fīd′), *adj.* بووە بە شاری لە ڕەووشت و جل وبەرگ و نەریتدا)؛ وەک دانیشتووی شاری لێ هاتووە؛ شارنشین کراو.

**citizen** (sit′ə-z'n), *n.* (١) شارنشین؛ دانیشتووی سەربەستی شارێک. (٢) هاوولاتی؛ ولاتی. (٣) مەدەنی؛ کەسێک کە لە هێزی چەکداردا نەبێ.

**citizen of the world,** هاوولاتی جیهانی کەسێک کە هەموو جیهان بە ولاتی خۆی دادەنێ و لە هەرچی شوێنێک بێ ئارام دەگرێ.

**citizeness** (sit′ə-z'n-is), *n.* هاوولاتی‌یەکی مێینە

**citizenry** (sit′ə-z'n-ri), *n.* هاوولاتیان؛ هاونیشتمانان

**citizenship** (sit′ə-z'n-ship′), *n.* (١) هاوولاتێتی؛ هاونیشتمانێتی (٢) ئەرکی سەرشان و مافی هاوولاتی.

**citizenship papers,** بڕوانامەی هاوولاتێتی: بڕوانامەی بوون بە هاونیشتمانی بێگانەیەک.

**citole** (sit′ōl, si-tōl′), *n.* = **cithern.**

**citric** (sit′rik), *adj.* مزرەمەنی: تایبەتی بە پرتەقال و لیمۆ نارنج.

**citron** (sit′rən), *n.* (١) ترنج (٢) دارترنج

**citrus** (sit′rəs), *n.* مزرەمیوە: وەک پرتەقال، لیمۆ، نارنج؛ مزرەمەنی.
*adj.* تایبەتی بە مزرەمیوە؛ تایبەتی بە داری مزرەمیوە.

**cittern** (sit′ẽrn), *n.* = **cithern.**

**city** (sit′i), *n.* (١) شار (٢) دانیشتووانی شارێک
*adj.* شاری؛ شار

**the City,** ناوچەی دارایی و بازرگانی شاری لەندەن

**city council,** ئەنجوومەنی شارەوانی.

**city-born** (sit′i-bôrn′), *adj.* لە شار لەدایکبووە؛ شاری.

**city-bred** (sit′i-bred′), *adj.* شاری؛ لە شار گەورەبووە یا گەورەکراوە

**city desk,** بەشی دەنگوباسی ناوشاری ڕۆژنامەیەک.

**city editor,** (١) نووسەری لێپرسراوی دەنگوباسی ناوشارو دابەشکردنی ئیش وکارەکان بەسەر ڕاپۆرتچی‌یەکانی ڕۆژنامەیەکدا. (٢) نووسەری لێپرسراوی بەشی دارایی (لە ڕۆژنامەی ئینگلتەرەدا).

**city hall,** (١) فەرمانگەی شارەوانی (٢) بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی

**City of God,** شاری خوا: ئاسمان

**City of Seven Hills,** شاری حەوت گردەکە: ڕۆما

**city-state** (sit′i-stāt′), *n.* ولاتێکی سەربەخۆ کە پێکدێت لە شارێکی سەربەخۆو ناوچەکانی دەوروبەری (وەک لە یۆنانی کۆندا هەبوو).

**civic** (siv′ik), *adj.* (١) شارستانی؛ تایبەتی بە شار؛ شار. (٢) تایبەتی بە هاوولاتی‌یان. (٣) تایبەتی بە هاوولاتێتی

**civics** (siv′iks), *n.pl.* زانستی پەروەردەی نیشتمانی.

**civil** (siv′'l, siv′il), *adj.* (١) تایبەتی بە هاوولاتی یا هاوولاتیان. (٢) میللی؛ تایبەتی بە کۆمەڵێک هاوولاتی و کاروباری نێوانیان: *( ~ affairs; ~ service; ~ war)* (٣) ڕەووشت جوان؛ ڕەفتار جوان. *( a ~ man)* . (٤) شارستانی. (٥) بەشی کات: *( a ~ year)* . (٦) شارستانی (یاسا).

**civil death,** سەندنەوەی هەموو مافێکی کەسایەتی لە هاوولاتی‌یەک لەبەر تاوانێکی گەورە.

**civil defence,** بەرگری میللی؛ بەرگری شارستانی.

**civil disobedience,** یاخی بوونی شارستانی؛ بەرهەڵستی لاشەڕ.

**civil engineer,** ئەندازیاری شارستانی.

**civil engineering,** ئەندازیاری شارستانی: دروستکردنی نەخشەی ڕێگاوبان، پرد، خانوو، بەندەر... هتد.

**civilian** (sə-vil′yən), *n.* (١) مەدەنی؛ کەسێک کە لە هێزی چەکداردا نەبێ. (٢) پسپۆڕی یاسای شارستانی.
*adj.* مەدەنی؛ ناسوپایی.

**civility** (sə-vil′ə-ti), *n.* ناسکی؛ ڕەووشت جوانی؛ نەزاکەت.

**civilization** (siv′'l-i-zā′shən, siv′'l-ī-zā′shən), *n.* (١) ژیار؛ شارستانیەت؛ ئاوەدانی. (٢) کردن بە شارستانی؛ بوون بە شارستانی. (٣) ئەو میللەت و ولاتانەی گەیشتوونەتە پلە یا ئاستی شارستانیەتی.

**civilize** (siv′'l-īz′), *v.t.* (١) کردن بە شارستانی؛ فێری شارستانیەتی کردن. (٢) پوختەو جوانکردنی خوو ڕەووشت؛ فێرکردنی خوو ڕەووشتی جوان.

**civilized** (siv′'l-īzd′), *adj.* (١) پێشکەوتوو: لە هونەرو زانیاری و زانستی کۆمەڵایەتیدا (میللەت، ولات). (٢) تایبەتی بەو میللەت و ولاتانەی کە لەم بوارانەدا پێشکەوتوون. (٣) ناسک؛ ڕەفتار جوان؛ بە نەزاکەت.

**civil law,** (١) یاسای ڕۆمانی: بەتایبەتی ئەو بەشەی کە هاوولاتی‌یە ڕۆمانی‌یەکانی دەگرتەوە. (٢) یاسای کەسێتی: هەموو ئەو یاسایانەی پەیوەندیان هەیە بە مافی کەسێتی‌یەوە نەک بە تاوانەوە (کە لە یاسای ڕۆمانی‌یەوە وەرگیراون)؛ یاسای شارستانی.

**civil liberties,** مافی مرۆڤ کە بەپێی یاسا پارێزراوە، وەک مافی بیرکردنەوەو قسەکردن و کردنی ئەو کارەی دەیەوێ بەمەرجێک دژی سوودی گشتی نەبێ.

**civil list,** مووچەو خەرجی تری ساڵانەی پاشاو ماڵ و خێزانەکەی.

**civilly** (siv′'l-i), *adv.* (١) بە ناسکی؛ بە نەزاکەت؛ بە ڕەفتار جوانی. (٢) بەگوێرەی یاسای کەسێتی.

**civil marriage,** مارەکردنی شارستانیەتی: مارەکردن لەبەردەمی دادگەر یا فەرمانبەرێکی تری میری نەک مەلاو قەشە.

**civil rights,** مافی کەسێتی هاوولاتی (گەلێک جار ئەو خەباتەش دەگرێتەوە کە میللەت دەیکات بۆ سەندنی مافی ڕامیاری و دارایی و کۆمەڵایەتی).

**civil servant,** فەرمانبەری میری؛ کاربەدەستی میری.

**civil service,** (١) هەموو بەشەکانی میری جگە لە هی یاسایی و دادگەری و سوپاو هێزی دەریایی. (٢) سەرجەم فەرمانبەرانی میری جگە لەوانەی کە لەم بوارانەدا کاردەکەن. (٣) سەرجەم پەیڕەوی‌یەکانی ئەم بەشانەی میری

**civil war,** جەنگی ناوخۆ؛ شەڕی براکوژی

**the Civil War,** جەنگی ناوخۆی ئەمەریکای باکوور لەنێوان ناوچەکانی سەروو (یەکێتی) و ناوچەکانی خواروو (کۆنفیدرەسی)ی ولاتەکەدا لە ساڵی ١٨٦١-١٨٦٥.

**civil year,** = **a calendar year; astronomical year.**

**clack** (klak), *v.i.* (١) تەقەتەق کردن. (٢) چەنەبازی کردن؛ دەمەوەری کردن. (٣) قرتەقرت کردن (مریشک).
*v.t.* (١) تەقەتەق پێکردن. (٢) چەنەبازی کردن؛ دەمەوەری کردن.
*n.* (١) تەقە؛ تەقەتەق. (٢) شتێک کە تەقەتەقی پێ دەکرێ. (٣) چەنەبازی.

**clack valve,** دەمەوانەیەکە کە تەقەی دێت کاتێک کە دادەخرێت.

**clad** (klad), *occasional past tense and p.p. of* **clothe.**

*adj.* حل لەبەر؛ پوشتە

**cladophyll** (klad′ə-fil), *n.* لق یا قەدی ڕووەکێکە کە شێوەو کاری وەك هی گەڵا وایە.

**claim** (klām), *v.t.* (١) داواکردن.

(٢) شایستەبوون؛ پێویست بوون: . *( This problem ~s our attention.)*

(٣) (أ) وا ووتن: . *( He ~s he saw the accident.)*

(ب) لاف وگەزاف لێدان.

*v.i.* لاف وگەزاف لێدان؛ وا ووتن

*n.* (١) داواکاری؛ داواکردن (٢) ماف؛ مافی داواکردنی شتێك؛ ماف بوون. (٣) شتێك کە کەسێك داوای بکات یا مافی داواکردنی هەبێ (پارچە زەوی، زیان بژاردن لەلایەن کۆمپانیای بیمەوە) (٤) لاف وگەزاف؛ وا ووتن؛ ووتەیەك کە خاوەنەکەی سووربێت لەسەری

**lay claim to,** داواکردن؛ بە هی خۆ دانان و داواکردن (موڵك، شت... هتد).

**claimant** (klām′ənt), *n.* داواکەر؛ لاف وگەزاف لێدەر.

**clairvoyance** (klâr-voi′əns), *n.* (١) توانای بینین یا هەست- پێکردنی شتی نەبینراو. (٢) چاوتیژی؛ هەست تیژی

**clairvoyant** (klâr-voi′ənt), *adj.* تواناداری بینین یا هەست- پێکردنی شتی نەبینراو.

*n.* کەسێك کە توانای بینین یا هەستپێکردنی شتی نەبینراوی هەبێ.

**clam** (klam), *n.* (١) لوولپێچ گیاندارێکی ئاوییە لەناو ئاو و لمی تەڕی دەوروپشتی ئاودا دەژی و قاوغێکی ڕەقی وەك بەردی هەیە.

(٢) گۆشتی ئەم گیاندارە

**clam up,** زمان بەستران؛ کشانەوە ناو قاوغی خۆو دەم بەستران (مرۆڤ).

**clam** (klam), *n.* = clamp.

**clamant** (klā′mənt), *adj.* (١) پڕ لە دەنگەدەنگ.

(٢) پەلە؛ گرنگ و پەلە

**clamber** (klam′bēr), *v.i. & v.t.* بە گران پیاهەڵگەڕان.

*n.* پیاهەڵگەڕانێکی گران

**clammy** (klam′i), *adj.* تەڕو سارد و لینج (دەست، پێست، شت)

**clamor** (klam′ēr), *n.* (١) هەرا؛ دەنگەدەنگ؛ هاوار؛ قیژە.

(٢) داوا کردنی شتێك بە هەرا هەرا.

*v.t.* (١) دەنگەدەنگ کردن؛ هاوار هاوار کردن.

(٢) (أ) (~ for)؛ هاوار بۆ کردن؛ داواکردن.

*( The foolish people were ~ing for war.)*

(ب) (~ against)؛ هاوارکردن دژ بە:

*( The newspapers were ~ing against the government's plans.)*

**clamor (a person) down,** هاوار بەسەردا کردن و دەم پێ داخستن.

**clamorous** (klam′ēr-əs), *adj.* (١) پڕ لە دەنگەدەنگ.

(٢) داواکەر یا سکاڵاکەر بە هەرا هەراو هاوار هاوار.

**clamour** (klam′ēr), *n., v.i. & v.t.* British Spelling.

**clamp** (klamp), *n.* مەنگەنە؛ گیرە: پێکارێکی کانزایییە بەکاردێت بۆ پێکەوەبەستنی دوو شت یا قایم کردنیان بە بادان یا بە برغوو.

*v.t.* گیرەنێدان؛ قایم کردن یا پێکەوەبەستن بە گیرە.

**clamp down (on),** [Colloq.], بە توندوتیژی لەگەڵ جوولانەوە؛ بە ڕەبروزۆنگتربوون؛ پێشێل کردن (ماف).

**clamp** (klamp), *n. & v.i.* پێ داگرتن لە ڕۆیشتندا؛ کوتانەوە بە پێ

**clamper** (klam′pēr), *n.* نالێکی بزماراوییە لە بنی پێڵاو دەدرێ بۆ نەخلیسکان لەسەر سەهۆل.

**clamshell** (klam′shel′), *n.* (١) قاوغی لوولپێچ

(٢) سەتڵی شت هەڵهێنجان یا پاکردنەوە.

**clan** (klan), *n.* (١) هۆز؛ خێڵ؛ تیرە؛ تایەفە؛ خاوخێزان.

(٢) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ

**clandestine** (klan-des′tin), *adj.* نهێنی (بەتایبەتی بۆ کردنی کاری خراپە یا شتی قەدەغەکراو)؛ پەنهانی.

**clang** (klaŋ), *v.i. & v.t.* (١) تەقەتەق کردن (بە دوو شتی کانزایی)؛ شەقە لێ هەڵسان (پەرداخ)؛ زرنگە لێ هەڵسان. (٢) بەیەکدا کێشان و شەقە لێ هەڵسان.

*n.* (١) تەقەتەق؛ شەقە. (٢) دەنگی خوێندنی هەندێ باڵندەی وەك قولنگ

**clank** (klaŋk), *n.* شەقە (پەرداخ)؛ هاڕە؛ زرنگە.

*v.i. & v.t.* شەقە لێ هەڵسان؛ هاڕەهاتن؛ هاڕە لێ هەڵسان؛ زرنگە لێ هەڵسان.

**clannish** (klan′ish), *adj.* هۆزپەرست؛ تیرەپەرست؛ خێڵەکی.

**clap** (klap), *v.i.* (١) چەپڵەلێدان.

(٢) بە پەلەو بەبێ تەنگ وچەڵەمە کردن یا خستنە ناو:

*( He was ~ped into jail.)*

*n.* (١) چەپڵە. (٢) زللە؛ شەپازلە.

**clapboard** (klab′ērd, klap′bôrd′, klap′bōrd′), *n.* تەختە- دارێکی باریك و درێژە سەرێکی تەنکترە لە سەرەکەی تری (بۆ ئەوەی سەری دارێکی تری بخرێتە سەر بێ ئەوەی دەرپۆقێ) دیواری دەرەوەی خانووی پێ دادەپۆشرێ.

**clapper** (klap′ēr), *n.* (١) چەپڵەلێدەر.

(٢) شتێك کە دەنگێکی وەك چەپڵەی لێ بێتە دەرێ (وەك زەنگ یا زمانی مرۆڤ).

**clapperclaw** (klap′ēr-klô′), *v.t.* (١) ڕووشاندن بە چڕنووك یا بە نینۆك. (٢) سەرزەنشت کردن.

**claptrap** (klap′trap′), *n.* قسەی قۆڕو بێ مانا؛ قسەی هیچ و بێ بایەخ (کە هەر لەبەرئەوە دەکرێ چەپڵەی بۆ لێ بدرێت).

*adj.* هیچ و بێ بایەخ (ووتە)؛ قۆڕو بێ مانا (ووتە).

**claque** (klak), *n.* (١) دەستەیەك چەپڵەلێدەری بە کرێ گیراو (لە شانۆ یا ئۆپەرایەکدا). (٢) دەستەیەکی مەرایییکەر.

**clarence** (klar′əns), *n.* عەرەبانەیەکی سەرداپۆشراوی چوارنەفەریی چوارپێچکەیییە.

**clarendon** (klar′ən-dən), *n.* شێوەیەکی چاپکردنە بریتییە لە تیپی باریك و تێر.

**clarification** (klar′ə-fi-kā′shən), *n.* ڕوونکردنەوە (بیر، ووتە، هەڵوێست).

**clarifier** (klar′ə-fī′ēr), *n.* (١) ڕوونکەرەوە (کەس یا ماددە)؛ پاکەرەوە (بەتایبەتی ماددەیەك کە شەرابی پێ پاك دەکرێتەوە) (٢) دەفری پاڵاوتن یا پاکردنەوەی شەکر.

**clarify** (klar′ə-fī′), *v.t. & v.i.* (١) پاکردنەوە لە خڵتە (شلە)؛ پاکبوونەوە؛ ڕوونکردنەوە (شلە). (٢) ڕوونکردنەوە (بیر، ووتە، هەڵوێست):

*( I would like to ~ my point.)*

**clarinet** (klar′ə-net′), *n.* کلارنێت: ئامێرێکی مۆسیقایە وەك زوڕنا؛ زوڕنا.

**clarinetist, clarinettist** (klar′ə-net′ist), *n.* کلارنێت لێدەر؛ زوڕناژەن.

**clarion** (klar′i-ən), *n.* (١) کەڕەنا (وەك هی سوپا).

(٢) دەنگی کەڕەنا یا شتێکی وەها.

*adj.* بەرزو ڕوون (دەنگ): . *( a ~ call)*

*v.t.* بڵاوکردنەوە بە دەنگی بەرزو بەتین.

**clarionet** (klar′i-ə-net′), *n.* = **clarinet.**

**clarity** (klar′ə-ti), *n.* ڕوونی (بیر، بیرکردنەوە، ووتە، هەڵوێست... هتد)؛ ڕێك و ڕەوانی.

**clash** (klash), *v.i.* (١) بەیەکدادان و دەنگێکی گەورە لێ پەیدابوون؛ بەریەککەوتن. (٢) بەیەکداهاتن (دوو کەس، دەستە، بیروڕا... هتد)؛ نەگونجان لەگەڵ یەکتریدا (مرۆڤ، ڕێباز، بیروڕا... هتد)؛ بەرەنگاربوون.

*v.t.* بەیەکدادان و پەیداکردنی دەنگێکی گەورە.

*n.* (١) دەنگێکی گەورە وەك بەریەککەوتنی دووشتی کانزایی.

(٢) نەگونجان (مرۆڤ، بیروڕا، ڕێباز... هتد)؛ ناکۆکی.

**clasp** (klasp, kläsp), *n.* (١) پێوەبەست (ئەبزونە، دەرزی، قولاپ، ... هتد)؛ قایمکەر. (٢) گرتن؛ بە دەست گرتن بەتوندی؛ باوەش پیاکردن

(۳) تەوقە؛ دەست پێوەگرتن؛ دەستی یەکتری گرتن؛ دەستی خۆ گرتن.

*v.t.* (۱) قایم کردن یا پێکەوەبەستن بە (ئەبزونە، دەرزی، قولاپ، گیرە... هتد).

(۲) بە توندی بە دەست گرتن؛ تەوقەکردن؛ باوەش پیاکردن.

(۳) خۆ پیاهەڵواسین؛ خۆ تێوەئاڵاندن.

**clasp knife,** چەقۆی گیرفان

**class** (klas, kläs), *n.* (۱) جۆر؛ چەشن؛ بابەت.

(۲) چین (گەل، کۆمەڵ) *( the working ~ ; the middle ~ )* .

(۳) پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی؛ چینە بەرزەکانی گەل.

(٤) چینایەتی (گەل، کۆمەڵ). (٥) پۆل (قوتابخانە).

(٦) وانە *( I have two ~es today.)* .

(۷) کۆمەڵێك قوتابی هاوپۆل کە پێکەوە دەرچن لە قۆناغێکی خوێندندا وەك هی ئاوەندی یا زانکۆ: *( the ~ of 1950)* .

(۸) نمرە؛ جۆنێتی شتێك؛ نمرە یا چۆنێتی هۆی هاتوچۆی گشتی (فڕۆکە، شەمەندەفەر) *( He always travels first ~ .)* .

(۹) هەموو ئەو هاوتەمەنانەی کە پێکەوە بانگ دەکرێن بۆ سوپا: *( They called up the ~ of 1960.)* .

(۱۰) هاوپۆل (زیندەوەرزانی: ڕووەك، گیاندار). (۱۱) دەستە (خەڵك).

(۱۲) [Slang]، نایابی (شێوازی جلوبەرگو ڕووالەت)؛ مۆدە.

*v.t.* هاوپۆل کردن؛ هاوبابەت کردن؛ ڕیزکردن؛ ڕێکخستن؛ هاوجۆر کردن.

**in a class by itself ( or oneself ),** بێ هاوتا؛ بێ وێنە؛ نایاب.

**class book,** (۱) پەڕاوی پۆل: پەڕاوێکە مامۆستا نمرەی قوتابیان و ئامادەبوونیانی تێدا تۆمار دەکات. (۲) پەڕتووکی پۆل: پەڕتووکێکە قوتابیانی پۆلێك دەریدەکەن وێنەی خۆیان و مامۆستا و دەنگوباس و چالاکییەکانی تێدایە.

**class-conscious** (klas'kon'shəs, kläs'kon'shəs), *adj.* هەستیاری چینایەتییە: هەست بە بوونی چینەکانی کۆمەڵ دەکات؛ هەست بە پلەو چینی خۆی زۆر دەکات لە کۆمەڵدا یا شانازی بە چینەکەیەوە دەکات یا پێی عەیبە

**class consciousness,** هەستی چینایەتی بوون؛ هەست بە چین و پلەی خۆ کردن لە کۆمەڵدا

**class day,** ڕۆژی ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیان لە قوتابخانە یا زانکۆدا.

**classic** (klas'ik), *adj.* (۱) نایاب؛ نمرە یەك.

(۲) کلاسیکی؛ کۆن؛ لەسەر دەستوورو شێوازی کۆنە.

(۳) کلاسیکی: تایبەتی بە وێژە، هۆنراوە، هونەر، کلتووری یۆنان و ڕۆمانی کۆن.

(٤) وەك یا بە پێوانەی هونەری و وێژەیی کۆنی یۆنان و ڕۆمانییەکان.

(٥) ڕێك و پێك و سادەو گونجاو بە دەستوور... هتد؛ ناڕۆمانتیکی.

(٦) [Colloq.]، کۆنە باو یا کۆنە شێوازێکی ناسراوە.

*n.* (۱) نووسەرێك یا هونەرمەندێکی نایاب.

(۲) هۆنراوەیەك، شانۆگەرییەك یا بەرهەمێکی هونەری زۆر باش؛ کلاسیکی.

(۳) [Colloq.]، ڕووداوێکی کۆنی بەناوبانگ *( This football game is ~ .)*

(٤) [Slang]، جلوبەرگی ئافرەتێك کە لەسەر شێواز یا دەستووری کۆن کرابێ.

**the classics,** وێژە یا ڕەوتی یۆنان و ڕۆمانی کۆن

**classical** (klas'i-k'l), *adj.* (۱) کلاسیکی

(۲) زانای وێژەو کلتوورو هونەری کۆنی یۆنان و ڕۆمان.

(۳) مۆسیقای کلاسیکی

(٤) چەسپیوو جێگیربوو نەك تازەو تاقیکەرەوەیی: *( ~ political science)* .

**classicalism** (klas'i-k'l-iz'm), *n.* = classicism.

**classicism** (klas'ə-siz'm), *n.* (۱) کلاسیزم: دەستوورو پەیڕەوو شێوازی هونەرو وێژەی کۆنی یۆنان و ڕۆمان وەك ڕێك و پێکی و سادەیی و گونجاوی و هەست گیراوی.

(۲) پەیڕەوی کردن یا گونجان لەگەڵ ئەم دەستوورو شێوازە.

(۳) زانین و لێکۆڵینەوەی هونەرو وێژەی یۆنان و ڕۆمانی کۆن.

(٤) ووتەیەك یا دەربڕینێك یا زاراوەیەکی لاتینی یا یۆنانی.

**classicist** (klas'ə-sist), *n.* (۱) کلاسیکی: کەسێکە کە بڕوای بە پەیڕەوی کردنی دەستوورو شێوازی وێژەو هونەری یۆنان و ڕۆمان هەبێ و لەسەری بڕوات. (۲) زانا یا قوتابی وێژەی یۆنان و ڕۆمانی کۆن.

(۳) کەسێکە کە بڕوای بە فێرکردنی زمانی لاتینی و یۆنانی هەبێ لە قوتابخانەداو داوای فێربوونیان بکات.

**classicize** (klas'ə-sīz'), *v.t.* کردن بە کلاسیکی.

*v.i.* لەسەر دەستوورو شێوازی کلاسیکی ڕۆیشتن (بە ڕاست یا بە درۆ).

**classifiable** (klas'ə-fī'ə-b'l), *adj.* هاوپۆل دەکرێ؛ پۆل پۆل دەکرێ؛ جۆر جۆر دەکرێ.

**classification** (klas'ə-fi-kā'shən), *n.* هاوپۆل کردن؛ پۆل پۆل کردن؛ جۆر جۆر کردن؛ ڕێکخستن.

-classificatory *(adj.)*.

**classified** (klas'ə-fīd'), *adj.* (۱) هاوپۆل کراوە؛ پۆل پۆل کراوە؛ جۆر جۆر کراوە. (۲) نهێنی؛ قەدەغەیە سەیر بکرێ (بەتایبەتی دەنگوباسێك یا ڕاپۆرتێکی نهێنی کە قەدەغەیە خەڵك بیبیستێ یا بیبینێ جگە لە هەندێ کاربەدەستی تایبەتی نەبێ لەبەر پاراستن و ئاسایشی وڵات).

**classified advertising,** جاڕی پۆل پۆل کراو لە ڕۆژنامەدا.

-classifier *(n.)*.

**classify** (klas'ə-fī'), *v.t.* (۱) هاوپۆل کردن؛ پۆل پۆل کردن.

(۲) قەدەغەکردن لە خەڵك: بەتایبەتی دەنگوباسێك یا ڕاپۆرتێکی نهێنی کە بیستنی یا بینینی قەدەغە دەکرێ لە هەمووکەسێك جگە لە هەندێ کاربەدەستی تایبەتی نەبێ لەبەر پاراستن و ئاسایشی وڵات.

**classis** (klas'is), *n.* دادگای کڵێسە یا ئەنجوومەنی پیران یا پیاوماقوڵانی کڵێسەی ناوچەیەك.

**classmate** (klas'māt', kläs'māt'), *n.* هاوپۆل (قوتابخانە، زانکۆ).

**classroom** (klas'rōōm', kläs'room'), *n.* ژووری پۆل (زانکۆ، قوتابخانە)؛ پۆل

**class struggle,** خەباتی چینایەتی؛ ناکۆکی چینایەتی لەنێوان چینەکانی کۆمەڵدا.

**classy** (klas'i), *adj.* [Slang], زۆر چاك و نایاب؛ شۆخ وشەنگ؛ هەڵکەوتوو؛ بەرز (شێوازو چۆنێتی).

**clastic** (klas'tik), *adj.* (۱) پارچەکانی لەیەکتری جیادەکرێتەوە: *( a ~ anatomical model)*

(۲) پارچە پارچە (زەمینناسی)؛ لە پارچە بەردی زۆر کۆن پێکهاتووە (زەمینناسی).

**clatter** (klat'ēr), *v.i.* (۱) هاڕەهاتن (قاپ وقاجاغ)؛ شەقەهاتن.

(۲) چەقەچەق کردن.

*v.t.* هاڕە لێ هەڵساندن؛ شەقە لێ هەڵساندن.

*n.* (۱) هاڕە؛ شەقە. (۲) غەڵبەغەڵب. (۳) چەقەچەق.

**claudicant** (klô'di-kənt), *adj.* شەل؛ لەنگ.

**claudication** (klô'di-kā'shən), *n.* شەلین؛ لەنگین.

**clause** (klôz), *n.* (۱) سارستە (زمانەوانی)؛ ڕستەی ناتەواو؛ دەستەیەك زاراوە کە بکەرو کرداری تێدابێ. (۲) بەند یا مەرج (بەتایبەتی لە بڕوانامەیەکی یاسایی یا ڕێکەوتنێکدا).

**claustrophobia** (klôs'trə-fō'bi-ə), *n.* نەخۆشییەکی دەروونییە بریتییە لە ترسی نائاسایی مرۆڤێك لە جێگەی تەنگەبەر یا داخراودا؛ ترسی جێگەی داخراو و تەنگەبەر.

**clavichord** (klav'ə-kôrd'), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی ژێدارە ئامێری پیانۆی لێوە وەرگیراوە.

**clavicle** (klav'ə-k'l), *n.* ئێسقانی چەڵەمە: ئێسقانێکی بچووکی بارێکە ئێسقانی سنگ و شان بەیەك دەگەیەنێ.

**claw** (klô), *n.* (۱) چڕنووك (پشیلە، پڵنگ، باڵندە، قرژاڵ... هتد)؛ چنگ؛ نینۆکی چەماوەو درێژو تیژ (۲) پێی چڕنووکدار.

*v.t. & v.i.* چڕنووك لێدان؛ چڕنووك لێ گیرکردن؛ بریندارکردن بە چڕنووك.

**claw hammer,** چەکوشێکە کە سەرێکی سەرەکەی نووشتابێتەوە بۆ بزمار هەڵکەندن.

**claw hatchet,** تەشوییەك یا تەورێك کە سەرە کولەکەی فاقدار بێ.

**clay** (klā), *n.* (١) گڵ؛ قوڕ ٢) گڵ؛ قوڕ (بەتایبەتی وەك هێمایەك كە لەشی مرۆڤی لێ دروستكراوە)؛ لەشی مرۆڤ.

-clayey *(adj.)*; clayish *(adj.)*.

**claymore** (klā′môr′, klā′mōr′), *n.* شمشێرێكی پانی دوو دەم تیژە لە كۆندا خەڵكی ئوسكوتلەندە بەكاریان دەهێنا

**clay stone,** بەردی گڵین

**clean** (klēn), *adj.* (١) پاك؛ خاوێن؛ بێگەرد؛ پوخت.
(٢) پاك؛ تازە شۆراو (جل‌وبەرگ). (٣) داوێن پاك.
(٤) خۆی لە پیسی دوور دەگرێ.
(٥) تەواو؛ وورد:
*( The police made a ~ sweep of the neighborhood.)*
(٦) هیچی تێدا نییە (گیرفان)؛ بەتاڵ: *( ~ pockets)* .
(٧) سپی (كاغەز). (٨) بژار كراو؛ بێ هەڵە: *( a ~ copy)* .
(٩) ساف *( a ~ cut)* . (١٠) بێ كەندو كۆسپ؛ هیچ بەری ناگرێ.
(١١) تۆزی نەتۆمی كەمە. (١٢) گۆشتەكەی دەخورێ (ئاین).
*adv.* (١) بە پاكی؛ بە پاك‌وخاوێنی. (٢) بە یەكجاری؛ بە تەواوی.
*v.t.* (١) پاكردنەوە؛ خاوێن كردن؛ پوختەكردن.
(٢) پوختەكردن؛ پاكردنەوەو ئامادەكردن بۆ لێنان (ماسی، باڵندە... هتد).
*v.i.* پاكبوونەوە؛ خاوێن بوونەوە.
  **clean out,** (١) بەتاڵ كردنەوەو پاكردنەوە (٢) بەتاڵ كردنەوە.
(٣) [Colloq.]، هیچ پێ نەهێشتنەوە؛ گسك لێدان (پارە):
*( The robbers cleaned him out.)*
  **clean up,** (١) پاكردنەوە (ماڵ)؛ پاك‌وخاوێن كردن‌و ڕێكخستن.
(٢) خۆ پاكردنەوە؛ خۆشتن‌و سەرداهێنان‌و جلی پاك لەبەركردن.
(٣) [Colloq.]، تەواوكردن (سفرەی خواردن)
(٤) [Slang] قازانجێكی زۆر كردن؛ دەسكەوت زۆر بوون.
  **come clean, [Slang],** پاكانەكردن؛ پێ لێنان (گوناه، تاوان)؛ چوونە ژێر (تاوان)
  **with clean hands,** بەبێ تاوان

**clean-cut** (klēn′kut′), *adj.* (١) دیار؛ ڕێك‌وڕەوان؛ ڕوون.
(٢) جیاكراوەتەوە؛ جیاواز؛ لە شتی تر جیایە.
(٣) تەڕپۆش؛ ڕێك‌وپێك: *( a ~ young man)*

**cleaner** (klēn′ēr), *n.* (١) كەسێكی پاككەرەوە (ماڵ، فەرمانگە... هتد).
(٢) پاككەرەوە (لە دووكانی جل لە ئوتودان‌و پاكردنەوە).
(٣) ئامێری پاكردنەوە. (٤) ماددەیەكی پاككەرەوە (بۆ لابردنی لەكەو پیسی تێ).

**clean-handed** (klēn′han′did), *adj.* بێ تاوان؛ بێ گوناه

**cleanliness** (klēn′li-nis), *n.* پاك‌وتەمیزی؛ پاك‌وخاوێنی؛ خاوێنی؛ پاكێتی؛ پاكی.

**cleanly** (klēn′li), *adj.* (١) خاوێن (مرۆڤ)؛ پاك‌وتەمیز (مرۆڤ)؛ شت بە پاكی ڕادەگرێ. (٢) هەمیشە بە پاك‌وتەمیزی ڕاگیراوە؛ پاك‌وخاوێن (جێگە)

**cleanly** (klēn′li), *adv.* بە پاك‌وتەمیری؛ بە پاكی؛ پاك‌وتەمیزانە؛ بە پاك‌وخاوێنی

**cleanness** (klēn′nis), *n.* پاكی؛ پاكێتی؛ پاك‌وتەمیزی؛ پاك‌وخاوێنی.

**cleanse** (klenz), *v.t.* (١) پاكردنەوە؛ خاوێن كردنەوە.
(٢) پاكردنەوە لە گوناه یا تاوان

**cleanser** (klenz′ēr), *n.* پاككەرەوە (ماددە)

**clean-shaven** (klēn′shāv′′n), *adj.* قژو ڕیش تاشراو؛ تەراش كردوو.

**cleanup** (klēn′up′), *n.* (١) پاكردنەوە؛ خاوێن كردنەوە.
(٢) نەهێشتنی خراپەو بەرتیل‌و بەدخوویی:
*( The new mayor planned a ~ of the city.)*
(٣) [Slang]، سوود؛ قازانج

**clear** (klêr), *adj.* (١) ڕووناك؛ ڕۆشن؛ ساف (ئاسمان): *( a ~ day)* .
(٢) ڕوون. (٣) دیار؛ باش دەبینرێ: *( a ~ outline)* .
(٤) ساف (مێشك)؛ زرنگ؛ ڕەوانبێژ: *( a ~ mind)* .
(٥) ڕوون؛ تێگەیشتنی ئاسانە: *( The meaning is ~ .)* .
(٦) ئاشكرا؛ دیار: *( a ~ case of neglect)* .
(٧) بێ گومان؛ دڵنیا: *( I am ~ on the matter.)* .
(٨) ساف (دەنگ)؛ بە باشی دەبیسترێ: *( a ~ sound)* .
(٩) پاك (دەروون، دڵ)؛ بێ تاوان *( a ~ conscience)* .
(١٠) ڕووت (قازانج)؛ سافی (دەسكەوت، قازانج):
*( He earned a ~ $ 10,000.)*
(١١) تەواو؛ بێ ڕادە. (١٢) ڕەوان؛ كراوە.
(١٣) بەرەڵا؛ بێ پەیوەندی.
(١٤) بەتاڵ؛ بەتاڵ كراو (پاپۆڕ، لۆری، شەمەندەفەر).
(١٥) قەرزار نییە؛ قەرزی لەسەر نییە.
(١٦) بێ تاوان؛ گومانی لەسەر نییە؛ بەخشراوە (دادگەری).
*adv.* (١) بە ڕێك‌و ڕەوانی؛ بە ڕوونی.
(٢) [Colloq.]، لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر؛ هەموو:
*( ~ through the town)*
*v.t.* (١) پاكردنەوە. (٢) ڕوونكردنەوە (هەڵوێست، بیر، نەخشە، مەبەست)
(٣) كردنەوە (ڕێ)؛ پاكردنەوە: *( He ~ed a path through the snow.)* .
(٤) لابردن: *( Let me ~ the dishes.)* .
(٥) بەتاڵ كردن؛ داگرتن (بار): *( They ~ed the freighter of cargo.)* .
(٦) بەرەڵاكردن؛ ڕزگاركردن (مرۆڤ، شت)؛ بەردان
(٧) بەخشین (دادگەری)؛ ئازادكردن: *( to ~ the accused)* .
(٨) بەسەردا بازدان؛ بەسەردا تێپەڕبوون.
(٩) بە ژێردا ڕۆیشتن بەبێ لێدان *( The boat ~ed the bridge.)*
(١٠) دانەوە (قەرز)
(١١) گومرگ كردن؛ بەردان یا ئازادكردنی پاپۆڕێك (پاش جێبەجێكردنی خواستی گومرگ‌و بەڕێوەبەرێتی بەندەر).
(١٢) دەسكەوتن؛ بە سافی بۆ مانەوە (مووچە، قازانج).
(١٣) قوڕگ پاكردنەوە: *( to ~ one's throat)*
(١٤) ناردنی چەك‌و دانی پارەكە (بۆ فەرمانگەی بڕینەوەی حسابی نێوان بانقەكان).
*v.i.* (١) ڕوون بوونەوە. (٢) بەربوون یا ئازادبوونی پاپۆڕێك لە بەندەر.
(٣) ئاڵوگۆڕكردنی چەك لەنێوان چەند بانقێكدا لە فەرمانگەی بڕینەوەی حسابی نێوان بانقەكان.
*n.* شوێنێكی بەتاڵ یا چۆڵ.
  **clear away,** (١) لابردن (قاپ لەسەر مێز).
(٢) ڕۆیشتن؛ لەبەرچاو لاچوون یا نەمان؛ لە چاو وون بوون.
  **clear off,** (١) لابردن. (٢) ڕۆیشتن؛ لەبەرچاو لاچوون.
  **clear out,** (١) بەتاڵ كردنەوە؛ بەتاڵ كردنەوەو پاكردنەوە.
(٢) [Colloq.]، ڕۆیشتن (مرۆڤ)؛ ڕۆین؛ بەجێهێشتن.
  **clear the air (or atmosphere),** لابردنی گیروگرفت‌و ناكۆكی‌و شتی بە هەڵە وەرگیراو (لەنێوان دوو كەس، دەستە، یا وڵاتدا).
  **clear up,** (١) ڕێك‌وپێك كردن؛ ڕێكخستن
(٢) بوون بە سایەقە؛ ئاووهەوا خۆش بوون.
(٣) ڕوونكردنەوە (بیر، مەبەست، نەخشە).
(٤) لابردنی هۆی ناكۆكی‌و گیروگرفت.
  **in the clear,** (١) سەربەست؛ بەرەڵا.
(٢) [Colloq.]، هیچی لەسەر نییە (مرۆڤ)؛ بێ تاوان.

**clearance** (klêr′əns), *n.* (١) ڕوونكردنەوە؛ پاكردنەوە.
(٢) بۆشایی نێوان دوو شت تا لەیەكتری نەدەن (وەك بۆشایی نێوان ئوتومبیل یا پاپۆڕو پردێك یا شەمەندەفەرو ئوتومبیل‌و تونێلێك).
(٣) ڕوونكردنەوەی حساب (بانق).
(٤) بڕوانامەی ڕێگەپێدان (پاپۆڕ یا فڕۆكە بە هاتن‌و ڕۆیشتن): *( ~ papers)* .
(٥) نرخ داشكاندن (بۆ خێرا فرۆشتنی شتومەكی كۆن).

**clearance sale,** نرخ داشكاندن (بۆ خێرا فرۆشتنی شتومەكی كۆن).

**clear-cut** (klêr′kut′), *adj.* (١) ڕوون؛ ئاشکرا؛ دیار؛ بێ پێچوپەنا.
(٢) داڕێژراو؛ سنووردار.

**clear-eyed** (klêr′īd′), *adj.* (١) باشبین؛ چاوتیژ
(٢) مێشك ساف؛ بیرتیژ؛ تێگەیشتوو.

**clear-headed** (klêr′hed′id), *adj.* مێشك ساف؛ تێگەیشتوو؛ ڕەوانبێژ

**clearing** (klêr′iŋ), *n.* (١) ڕوونکردنەوە؛ ڕوون بوونەوە؛ ڕوونی.
(٢) پارچەیەك زەوی كە پاك كرابێتەوە لە دارودرەخت (بەتایبەتی لە دارستانێکدا بە برینی دارودرەختەکە). (٣) (ا) ئاڵوگۆڕکردنی چەك لەنێوان بانقەکانداو حساب ووردکردنەوە (ب) (.*pl*). سەرجەمی ئەو حساباتانەی بەم جۆرە دەبڕێنرێتەوە.

**clearinghouse** (klêr′iŋ-hous′), *n.* فەرمانگەی ئاڵوگۆڕکردنی چەك و حساب برینەوە (لەنێوان بانقەکاندا).

**clearly** (klêr′li), *adv.* بە ڕوونی؛ بە ڕێك وڕەوانی؛ بە ئاشکرا.

**clearness** (klêr′nis), *n.* ڕوونی؛ ڕێك وڕەوانی.

**clear-sighted** (klêr′sīt′id), *adj.* (١) باشبین؛ چاوتیژ.
(٢) مێشك ساف؛ تێگەیشتوو؛ ڕەوانبێژ.

**cleat** (klēt), *n.* (١) سنگ یا گۆشە كە دادەکوترێ بەژێر شتێکدا بۆ قایم کردن یا پتەوکردنی (وەك ڕەفە) (٢) ناڵی بن پێڵاو
(٣) داری گوریس پێوەهەڵکردن یا پێوەبەستن

*v.t.* بە سنگەوە بەستن بۆ قایم کردن.

**cleavable** (klēv′ə-b'l), *adj.* دەقلیشێنرێ؛ دەتلیشێنرێ

**cleavage** (klēv′ij), *n.* (١) قلیش بردن؛ تلیش بردن؛ شەق بردن؛ لەیەك جیابوونەوە؛ درزبردن؛ داقلیشان؛ داتلیشان. (٢) قلیش؛ تلیش؛ درز- وەك. قلیشی نێوان مەمکی ئافرەت و سمی گیانداری دووسم).
(٣) داتلیشان یا بەش بەش بوونی شانەی گیانەوەر (زیندەوەرزانی).
(٤) داقلیشانی کانزا بە پانی

**cleave** (klēv), *v.t.* (١) قلیشاندن (وەك بە تەورو تەوراس)؛ داتلیشاندن.
(٢) کونکردن؛ کوناودەرکردن (٣) لەیەك جیاکردنەوە.

*v.i.* (١) قلیشان (بە تەورو تەوراس)؛ داتلیشان؛ لەیەك جیابوونەوە
(٢) ڕێگە بۆ خۆ کردنەوە بەناو بنچك و دەوەندا

**cleave** (klēv), *v.i.* (١) خۆ پێوەنووسان
(٢) دەست لێ بەرنەدان؛ بۆ دڵسۆز بوون.

**cleaver** (klēv′ēr), *n.* چەپەچاغ (قەسابی).

**cleek** (klēk), *n.* (١) قولاپێکی گەورە. (٢) داری یاری گۆلف

**clef** (klef), *n.* نیشانەی ئاوازی مۆسیقا (كە بەرزو نزمی دەنگ پیشان دەدات لەسەر ئەو کاغەزەی ئاوازی مۆسیقای لەسەر دەنووسرێ).

**cleft** (kleft), *n.* درز؛ قلیش؛ تلیش؛ کەلێن

**cleft** (kleft), *adj.* (١) قلیشاو؛ داتلیشاو (سمی گیانداری دووسم).
(٢) داقلیشاو (گەڵا) (*a ~ leave*)

**cleft palate,** قلیشێکی زگماکییە لە ئاسمانەی دەمدا

**cleistogamic** (klīs′tə-gam′ik), *adj.* = cleistogamous.

**cleistogamous** (klīs-tog′ə-məs), *adj.* خۆ لەخۆچاککەر (گوڵ)

**cleistogamy** (klīs-tog′ə-mi), *n.* خۆ لەخۆچاککردن (گوڵ)

**clemency** (klem′ən-si), *n.* (١) بەزەیی؛ بەزەیی پیاهاتنەوە (تاوانبار یا دوژمن)؛ دڵنەرمی (٢) فەرمانی بەزەیی (تاوانبار یا دوژمن)؛ فەرمانی- لێبووردن (٣) فێنکی (ئاووهەوا)؛ نە گەرمی و نە ساردی.

**clement** (klem′ənt), *adj.* (١) بە بەزەیی؛ دڵنەرم
(٢) فێنك (ئاووهەوا)؛ نە گەرم و نە سارد.

**clench** (klench), *v.t.* (١) پەرچدانەوە (بزمار)؛ بەرپەرچدانەوە
(٢) جیرکردنەوە یا لەیەك گیرکردن (ددان)؛ قوچاندن یا نوقاندن بەتوندی دەست یا مستەکۆڵە) (٣) بەتوندی گرتن

*n.* (١) گرتنێکی توند (٢) ئامێرێکی بەتوندگرت؛ سەری پەرچدراوەی بزمار.

**clepsydra** (klep′si-drə), *n.* کاتژمێری ئاوی (كە کات دەژمێرێ بەهۆی بەرەبەرە چوونی ئاو یا شلەیەکی تر بە کونێکدا).

**cleptomania** (klep′tə-mā′ni-ə), *n.* = kleptomania.

**clerestory** (klêr′stôr′i, klêr′stō′ri), *n.* (١) ڕووناککەرەوەی کڵێسە: بەشی سەرووی کڵێسەیەك كە دیوارەکانی پەنجەرەی هەیەو ناوەوەی کڵێسەکە ڕووناك دەکاتەوە. (٢) دیواری پەنجەرەدار بۆ ڕووناکی و هەوا گۆڕین.

**clergy** (klūr′ji), *n.* قەشەکان؛ سەرجەمی قەشەکان؛ ڕابەڕانی کڵێسە

**clergyman** (klūr′ji-mən), *n.* قەشە؛ ڕابەری کڵێسە.

**cleric** (kler′ik), *n.* قەشە؛ قەشەیەك.

*adj.* قەشەیی؛ هی قەشە یا قەشەکان.

**clerical** (kler′i-k'l), *adj.* (١) قەشەیی؛ هی قەشە یا قەشەکان.
(٢) هی نووسەری فەرمانگە: (*~ jobs*).
(٣) دەسەڵاتی ڕابەڕانی کڵێسەی لە کاروباری ڕامیاریدا پێ باشە (بە تەوسەوە).

*n.* (١) قەشە؛ قەشەیەك. (٢) کەسێك كە دەسەڵاتی ڕابەڕانی کڵێسەی لە کاروباری ڕامیاریدا پێ باشە (بە تەوسەوە).

**clericalism** (kler′i-k'l-iz'm), *n.* دەسەڵاتی کڵێسەو ڕابەڕانی لە کاروباری ڕامیاریدا.

**clericals** (kler′i-k'lz), *n.pl.* جل وبەرگی قەشە.

**clerisy** (kler′ə-si), *n.* چینی خوێندەواران؛ ڕۆشنبیران.

**clerk** (klūrk), *n.* (١) نووسەری فەرمانگە؛ میرزا.
(٢) یاریدەدەری قەشە (بۆرەپیاو). (٣) فرۆشیار (كە بە مووچە لە دووکانێکدا کاردەکات). (٤) [Archaic]، قەشە. (٥) [Archaic]، خوێندەوار.

*v.i.* نووسەری کردن لە فەرمانگەدا؛ فرۆشیاری کردن لە دووکانێکدا بە مووچە

-clerkly (*adv.*); clerkship (*n.*).

**clever** (klev′ēr), *adj.* (١) زۆرزان؛ قومارباز؛ زۆڵ (ووتەو کردار).
(٢) دانا؛ سەردەرچوو؛ چالاك. (٣) زیرەك؛ زرنگ.
(٤) زیرەکی نووسەرەکەی پیشان دەدات: (*a ~ book*).
(٥) [Dial.]، ڕووخۆش. (٦) [Dial. or Slang]، شۆخ؛ قۆز

**clevis** (klev′is), *n.* شیشێکی ئاسنە لە شێوەی تیپی U دایە هەردوو سەری کوناودەر کراوەو بە پارچە ئاسنێك پێکەوە بەستراوە. شتی پێ دەبەسترێ بەدوای تراکتۆرو ئوتومبیلەوە بۆ ڕاکێشانی.

**clew** (kloo), *n.* (١) گورزە بەن؛ گورزە ڕێس؛ کڵافە دەزوو.
(٢) کلیلی لێکدانەوە یا چارەسەرکردنی گیروگرفتێك. (هەروەها " clue ").
(٣) قوژبنی خوارووی بایەوان (کەشتی بایەوان)؛ ئەڵقەی بایەوان؛ پەتی جۆڵانە.

*v.t.* (١) ( ~ **up** )، هەڵکردن (ڕێس، بەن، پەت)؛ کڵافەکردن؛ گورزەکردن.
(٢) ( ~ **out** )، نیشاندان؛ کلیلی چارەسەر پێدان.

clew down, داگرتنی بایەوانی کەشتی بایەوان.

clew up, هەڵکردنی بایەوانی کەشتی بایەوان.

**clew lines,** سەرجەمی گوریس و بەکرەو ئەڵقەو ڕاگرە یا تەوەری بایەوانی کەشتی بایەوان.

**cliché** (klē-shā′), *n.* (١) کلێشە (چاپەمەنی)؛ کلێشە.
(٢) کلێشە: ووتەیەکی بێ تام و پەرپووت.

**click** (klik), *n.* (١) تەقە؛ قرتە (وەك هی قفڵ یا ئەڵقەڕیزی چەپەرەو دەرگ لەکاتی داخستندا). (٢) چرکە یا قرتە (وەك هی گرێی زنجیری پاسکیل لەکاتی لێخوڕیندا كە ددانەکان لە پێچکەی پاسکیلەکە گیردەکات و بەری دەدات).
(٣) دەنگی بێژانی هەندێ تیپ.

*v.i.* (١) قرتەهاتن؛ چرکەهاتن؛ تەقەهاتن.
(٢) [Slang]، لەپڕ ڕوون دەبێتەوە یا تێگەیشتنی ئاسان دەبێت (هەڵوێست، بیر، کردەوە... هتد)؛ سەرکەوتوو بوون.

*v.t.* قرتە، چرکە، یا تەقە لێ هەڵسان.

**client** (klī′ənt), *n.* (١) پاشکۆ (مرۆڤ)؛ دەست وپێوەند؛ کەسێك كە بۆ ژیان و پاراستنی چاوی لە دەستی کەسێکی ترەوەیە.
(٢) کەسێك یا کۆمپانیەیەك یا دەزگایەك كە پارێزەرێك یا ژمێریارێك دەگرێ بۆ جێبەجێکردنی کارێك. (٣) کڕیار؛ مەعمیل.

**clientage** (klī′ən-tij), *n.* = clientele.

**clientele** (klī′ən-tel′), *n.* (١) کڕیار یا مەعمیلی هەمیشەیی پارێزەر، پزیشك، ئوتێل، بانق یا دووکانێك. (٢) هەموو ئەم کڕیار یا مەعمیلانە

**cliff** (klif), *n.* کەندەڵان (بەتایبەتی نزیك کەناری دەریا یا زەریا).

**cliff dweller,** ئەندامێکی تیرە هیندی‌یەکانی ڕۆژئاوای ئەمەریکای باکوور کە لە ئەشکەوت و کەندەلاّندا دەژیا

**cliff-hanger** (klif-hāŋ'ēr), *n.* (١) زنجیرەیەکی شانۆگەری سەر تەلەفزیۆنە کە هەموو بەشێکی بە ڕووداوێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش کۆتایی دێت، بەلاّم ئەنجامەکەی نادات بەدەستەوە هەتا بەشی دواتر.
(٢) ملەملانێیەکە ئەوەندە هاوتایە ئەنجامەکەی ناتوانرێ بزانرێ هەتا تەواو دەبێ.

**climacteric** (klī-mak'tēr-ik, klī'mak-ter'ik), *n.* (١) کاتی گۆڕینێکی سەرەکی لە ژیانی مرۆڤێکدا؛ قۆناغی گۆڕینێکی لەشی سەرەکی لە مرۆڤێکدا (بەتایبەتی وەستانی بێ نوێژی لە ئافرەتی بەساڵاچوودا).
(٢) قۆناغێك یا ڕووداوێکی زۆر گرنگ و سەرەکی.
*adj.* زۆر گرنگ و سەرەکی.
**the grand climacteric,** ساڵی شەست و سێهەم لە تەمەنی مرۆڤدا کە گوایە گۆڕینی لەشی زۆر گرنگی لێ ڕوودەدات

**climactic** (klī-mak'tik), *adj.* ئەوپەڕی بەرزی؛ پلە یا خاڵی هەرە بەرز لە ژیانی کەسێك، چیرۆکێك یا ڕووداوێکدا

**climactical** (klī-mak'ti-k'l), *adj.* = **climactic.**

**climate** (klī'mit), *n.* (١) ئاووهەوا (بەتایبەتی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژی وەك چەند ساڵێك)؛ کەش. (٢) باری گشتی شوێنێك کە کاربکاتە سەر چۆنێتی ژیان و پەیوەندی ناو خەڵك یا کۆمەڵ *( a tense ~ )*.
(٣) ناوچەیەك کە ئاووهەوایەکی تایبەتی هەبێ:
*( He went south to a warmer ~ .)*

**climatic** (klī-mat'ik), *adj.* ئاووهەوایی؛ ئاووهەوا

**climatically** (klī-mat'i-k'l-i, klī-mat'ik-li), *adv.* لەڕووی ئاووهەواوە.

**climatology** (klī'mə-tol'ə-ji), *n.* زانستی ئاووهەوا؛ کەشناسی.

**climax** (klī'maks), *n.* (١) پلەی هەرە بەرز؛ ڕۆپ؛ بەرزترین پلە (کار، ڕووداو... هتد)؛ تاف؛ گەرمە (٢) بەرزترین بەش یا ڕووداو (شانۆگەری، چیرۆك یا فیلمی سینەما). (٣) ئاوهاتنەوە؛ ڕەحەت بوون.
*v.i. & v.t.* ئاوهاتنەوە؛ ئاوهێنانەوە؛ ڕەحەت بوون؛ گەیاندنە بەرزترین پلە.

**climb** (klīm), *v.i. & v.t.* (١) پیاهەڵگەڕان (شاخ، گرد، دیوار... هتد)؛ پیاسەرکەوتن (٢) پیاهەڵگەڕان (وەك لاولاو بە دیواردا).
(٣) بەرزبوونەوە *( He ~ed to power in ten years.)*.
*n.* (١) پیاهەڵگەڕانێك؛ پیاسەرکەوتنێك؛ سەرکەوتن
(٢) شتێك یا شوێنێك کە پیایدا هەڵبگەڕێیت.
**climb down,** هاتنەخوارەوە (شاخ، دیوار، گرد)؛ وازلێهێنان (هەڵوێست یا بیرێکی نابەجێ

**climber** (klīm'ēr), *n.* (١) پیاهەڵگەڕ (مرۆڤ، شت)؛ پیاهەڵگەڕ (شاخ، گرد) (٢) جۆرە بزمارێکە لە پێڵاو دەدرێت بۆ پیاهەڵگەڕانی کرێکاران بە داری تەلەفۆندا (٣) [Colloq.]، کەسێك کە هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدات لە کۆمەڵدا پێش بکەوێت و پلەی بەرزبێتەوە بە مەرایی و ماستاو کردن.
(٤) ڕووەکی پیاهەڵگەڕاو (وەك لاولاو، دارمێو)

**climbing irons,** جۆرە بزمار یا چوکلەیەکە دەدرێت لە پێڵاو بۆ پیاهەڵگەڕان بە داری تەلەفۆندا

**clime** (klīm), *n.* [Poetic]. وولات؛ هەرێم؛ ناوچە؛ ئاووهەوا.

**clinch** (klinch), *v.t.* (١) پەرچدانەوە (بزمار)؛ بەرپەرچدانەوە
(٢) قایم کردن یا چەسپاندن بەهۆی پەرچدانەوەوە
(٣) بڕینەوەی تەواوی یا یەکجاری (مشت‌ومڕ، سەوداگەری)؛ بە لایەکدا خستن؛ مۆرکردن (سەوداگەری) *( to ~ a deal)*.
*v.i.* (١) پەرچدانەوە (بزمار)؛ بەرپەرچدانەوە
(٢) گرتنی بەرامبەرەکەت لە یاری بۆکسبازیدا تا نەتوانێ بۆکس بهاوێت؛ توندگرتن (٣) [Slang]، باوەش پیاکردن
*n.* (١) پێکەوەبەستن؛ پێکەوە قایم کردن. (٢) پەرچدانەوە.
(٣) بزمارێکی پەرچدراوە. (٤) ئەو بەشەی بزمارێك کە پەرچدراوەتەوە.
(٥) گرتنی بەرامبەرەکەت تا بۆکس نەهاوێت (یاری بۆکسبازی)؛ توندگرتن.
(٦) [Slang]. باوەش پیاکردن.

(٧) قوڵفەی گوریس یا پەت؛ گرێ (گوریس، پەت).

**clincher** (klin'chēr), *n.* (١) بگر (مرۆڤ، ئامێر، شت).
(٢) بزمارێك کە پەرچ بدرێتەوە. (٣) چەکوش یا ئامێرێکی پەرچدەرەوە
(٤) [Colloq.]، بە لایەکدا خەر: ووتەیەك یا دەرکەوتنی ڕاستی‌یەك یا ڕووداوێکی گرنگ کە مشت‌ومڕێك دەخات بە لایەکداو دەیبڕێنێتەوە؛ بڕیاردەر (ووتە، ڕاستی، ڕووداو... هتد).

**cling** (kliŋ), *v.i.* (١) خۆ پێوە هەڵواسین (مرۆڤ، ڕووەك)؛ دەست پێوەگرتن. (٢) خۆ پێوەنووسان؛ پێوەنووسان؛ لێ دوورنەکەوتنەوە.
(٣) دەست لێ بەرنەدان؛ واز لێ نەهێنان:
*( He ~s to old-fashioned ideas.)*

**clinging vine,** ژنێکە کە لە ئەندازە بەدەر پشت بە مێردەکەی یا دۆستەکەی دەبەستێ و هەر چاوی لە دەستی ئەوەوەیە

**clingstone** (kliŋ'stōn'), *adj. & n.* میوەیەکە وەك قۆخ کە ناوکەکەی نووسابێت بە گۆشتەکەیەوە.

**clingy** (kliŋ'i), *adj.* لیقن؛ پێوەنووساو؛ جیڕ.

**clinic** (klin'ik), *n.* (١) دیدەنگەی پزیشك؛ تیمارگە؛ فەرمانگەی پزیشك.
(٢) فێرکردنی پزیشکەوانی لەڕێی تیمارکردنی نەخۆشەوە لەبەرچاوی قوتابیانی پزیشکەوانی. (٣) دەزگایەکی پزیشکەوانی‌یە کە لە نەخۆشی‌یەکی تایبەتی دەکۆڵێتەوەو چارەسەری ئەو کەسانەش دەکات کە ئەو نەخۆشی‌یەیان هەیە: *( a cancer ~ )* (٤) دەزگایەکی کۆمەلایەتی‌یە کە ئامۆژگاری خەڵك دەکات لە بارێکی ژیاندا: *( a domestic-relations ~ )*.

**clinical** (klin'i-k'l), *adj.* (١) پزیشکی؛ هی جێگەی نەخۆش؛ تایبەتی بە نەخۆشی لە جێگەدا کەوتوو؛ تایبەتی بە چارەسەرکردنی نەخۆش و لێکۆڵینەوەی نەخۆشی‌یەکەی بە کردار نەك لە تاقیگەدا.
(٢) (أ) بە شێوەیەکی زانستی و بێ لایەنی و بێ هەستی و هێمنی:
*( She regarded his death with ~ detachment.)*
(ب) شیکردنەوەیی؛ شیتاڵکاری: *( ~ details)*
(٣) لەکاتی سەرەمەرگدا دەکرێ.
-clinically *(adv.)*.

**clinician** (kli-nish'ən), *n.* پزیشکی کردەکاری: پزیشکێکە کە چارەی نەخۆشی بکات ڕاستەوخۆ نەك لە تاقیگەدا لە نەخۆشی بکۆڵێتەوە

**clink** (kliŋk), *v.i. & v.t.* شەقە لێ هەڵسان (دوو پەرداخ)؛ زڕە لێ هەڵسان (پەرداخ کاتی خواردنەوە)؛ بەیەکدادانی دوو پەرداخ و زڕە لێ هەڵسانیان لە ئاهەنگی خواردنەوەدا.
*n.* (١) زڕە (پەرداخ کاتی خواردنەوە)؛ شەقە؛ هاڕە.
(٢) [Colloq.]، بەندیخانە (لەبەر زڕەی پێوەند).

**clinker** (kliŋk'ēr), *n.* (١) خشتێکی زۆر سەخت.
(٢) خشتێك یا کۆمەڵە خشتێك کە بەهۆی گەرمی‌یەوە وەك شووشەی لێ هاتبێ
(٣) تۆپەڵێك پاشماوەی کانزای سووتاو یا تواوە.
(٤) [Slang]، هەڵە (بەتایبەتی لە ئاوازدا).

**clinker-built** (kliŋk'ēr-bilt'), *adj.* بە تەختەو تەبەقە ئاسنی سوار یەکتر بوو دروستکراوە (پاپۆڕ).

**clino-** (klī'nō, klī'nə), پێشگۆیەکە بەمانای: لێژ؛ لێژی؛ لێژایی.

**clinometer** (klī-nom'ə-tēr), *n.* ئامێری پێوانی لێژایی (بۆری ئاو، زێراب، بەنداو... هتد).

**clip** (klip), *v.t.* (١) قرتاندن (مقەست)؛ بڕین یا لێکردنەوە (بە مقەست یا برنگ). (٢) کورتکردنەوە (باڵی باڵندە)؛ بڕینەوە (مەڕ یا بزن بە برنگ)؛ قەڵەم کردن (دارو درەخت و ڕووەك).
(٣) [Colloq.]، پیاکێشان (بە پەلەو بە توندی)؛ مستەکۆڵە پیاکێشان.
(٤) قەراغ قرتاندنی پارە: *( ~ a coin)*.
(٥) [Slang]، دەستبڕین؛ لەخشتەبردن؛ خەڵەتاندن.
*v.i.* (١) بڕین؛ قرتاندن؛ بڕینەوە.
(٢) لێکردنەوەی ووتار، دەنگوباس، یا وێنەیەك لە ڕۆژنامەیەك یا گۆڤارێك بۆ هەڵگرتنی. (٣) [Colloq.]، بە پەلە ڕۆیشتن یا دەرچوون.
*n.* (١) بڕینەوە (مەڕو بزن)؛ قرتاندن؛ قەڵەم کردن؛ لێکردنەوە.

(۲) شتێکی قرتێنراو؛ پارچەیەکی لێکراوە یا بڕاو (ڕۆژنامە، فیلمی سینەما).
(۳) سەرپاکی ئەو بەرگنەی کە لە وەرزێکدا یا بە جارێك لە مەڕێك دەبڕرێتەوە.
(٤) [Colloq.]، مستەکۆلەیەکی لەپڕ؛ پیاکێشانێکی توندو خێرا.
(٥) [Colloq.]، جوولەیەکی لەپڕو خێرا.

**clip** (klip), *v.i. & v.t.* (۱) بە توندی گرتن؛ پێکەوەنان؛ پێکەوەبەستن؛ لێکدان (۲) [Archaic & Dial.]، باوەش پیاکردن.
(۳) باوەش پیاکردن لە دواوەو وەستاندن یا بە زەویدا دان کە کردەیەکی قەدەغەیە (یاری فوتبۆڵی ئەمەریکی).

*n.* (۱) دەرزی کاغەز: *( paper- ~ )* . (۲) پێکارێك کە دوو شت لەیەك بدات.
(۳) (ئنوارە خاڵی سێهەم). (٤) [Obs.]، باوەش پیاکردن.

**clipped form (or word),** کورتەی ووشەیەك (بۆ نموونە: auto بۆ automobile ) .

**clipper** (klip′ẽr), *n.* (۱) قرتێنەر یا بڕەر (مرۆڤ).
(۲) (*pl.*)، ئامێری قرتاندن، بڕینەوە، یا بڕین (مەکینەی نینۆك کردن، بڕنگ، مقەستی سەرتاش، پێکاری قەڵەم کردن یا کورتکردنەوەی لق‌وپۆپی دارو درەخت). (۳) کەشتی‌یەکی بایەوانی کۆن.
(٤) فڕۆکە یا ئوتومبیلێکی خێرا.

**clipping** (klip′iŋ), *n.* (۱) پارچەیەکی لێکراوە یا قرتێنراو لە شتێك.
(۲) بابەتێکی لێکراوە لە ڕۆژنامە بۆ هەڵگرتن.

**clique** (klēk, klik), *n.* دەستە (خەڵك)؛ تاقم (بە زۆری ناپەسەندی دەردەبڕێ)

*v.i.* [Colloq.], بوون بە تاقم؛ یەکگرتن‌و تاقم درووستکردن.

**cliquish** (klē′kish, klik′ish), *adj.* (۱) تاقمی؛ وەك تاقم.
(۲) هەر لەگەڵ تاقمی خۆیدا هەڵدەستێت‌و دادەنیشێ؛ پەیوەندی هەر لەگەڵ تاقمەکەی خۆیەتی نەك لەگەڵ خەڵکی تر.

**cliquy, cliquey** (klē′ki, klik′i), *adj.* = **cliquish.**

**clitoris** (klī′tə-ris, klit′ə-ris), *n.* قیتکە؛ میتکە.

**cloaca** (klō-ā′kə), *n.* (۱) زێراب (۲) ئاودەستخانە؛ پێشاو
(۳) بۆشایی‌یەکە کە هەموو جۆرە پیسایی‌یەکی تێدا کۆدەبێتەوە بەر لە هاتنە دەرەوەی لە خشۆك‌و ماسی‌و باڵندەی تەڕو ووشکانیدا هەیە.

**cloak** (klōk), *n.* (۱) عەبا؛ جبە.
(۲) شتێك کە شت دادەپۆشێت یا دەیشارێتەوە؛ شاردنەوە.

*v.t.* (۱) عەبا لەبەرکردن؛ جبە کردنەبەر؛ عەبا پیادان. (۲) شاردنەوە.

**cloak-and-dagger** (klōk′ən-dag′ẽr), *adj.* پڕ لە پیلان‌و کردەوەی سووسەیی‌و دەماغ کردن‌و فێڵبازی.

**cloakroom** (klōk′rōōm′, klōk′room′), *n.* ژووری دانانی کاتی چاکەت، پاڵتۆ، چەترو جانتا (لە قوتابخانە، تیاترۆ یا مۆزەخانەیەکدا).

**clobber** (klob′ẽr), *v.t.* [Slang], (۱) لێدان بە توندی‌و دڵڕەقانە.
(۲) بەزاندنی تەواو یا یەکجاری؛ بەزاندن.

**cloche** (klōsh), *n.* (۱) دەفرێکی شووشەی زەنگ شێوەیە ڕووەکی ناسکی پێ دادەپۆشرێ. (۲) کڵاو یا شەپقەی ژنانە.

**clock** (klok), *n.* کاتژمێری گەورە (هی سەرمێز یا دیوار)؛ کاتژمێری سەردیوار.

*v.t.* (۱) تۆمارکردنی خێرایی یا کات پێچوونی پێشبڕکێ‌یەك یا ڕاکەرێك بە کاتژمێرێك کە دەتوانرێ بوەستێنرێ‌و بخرێتەوە کار بەپێی ئارەزوو بۆ پێوانی کاتێکی تایبەتی). (۲) تۆمارکردنی کاتی ئیشکردن (کرێکارانی کارخانە): (هاتنە سەر کار: **clock in** ، کار بەجێهێشتن: **clock out** ) .

**clock** (klok), *n.* نەقشی سەر گۆرەوی.

**clocklike** (klok′līk′), *adj.* وەك کاتژمێرە ( لە ووردی، تەواوی، ڕێك‌وپێکیدا).

**clockwise** (klok′wīz′), *adv. & adj.* بە ئاراستەی جوولەی دەستی کاتژمێرە

**clockwork** (klok′wūrk′), *n.* (۱) ئیشکردنی کاتژمێر؛ سەرجەمی پارچەکانی کاتژمێرو کارکردنیان پێکەوە؛ ئامێری کاتژمێر.
(۲) ئامێرێکی وەك کاتژمێر کە لە سپرینگ‌و پێچکەو شتی وەها پێکهاتبێ (وەك هەندێ بووکەشووشەی ئۆتۆماتیکی).

**like clockwork,** زۆر ووردو تەواو و ڕێك‌وپێك.

**clod** (klod), *n.* (۱) گلمتك؛ کلۆ؛ کەرسەك. (۲) خاك؛ زەوی.
(۳) کەودەن؛ دەبەنگ؛ کەسێکی کەر یا گەلحۆ؛ کەسێکی بێ مێشك
(٤) ئەو بەشەی ملی ڕەشەوولاخ کە بە شاذی‌یەوە نووساوە.

**cloddish** (klod′ish), *adj.* کەر؛ دەبەنگ؛ بێ مێشك.

**cloddy** (klod′i), *adj.* پڕ لە گلمتك، کلۆ، یا کەرسەك.

**clodhopper** (klod′hop′ẽr), *n.* (۱) جووتیار
(۲) کەسێکی دەبەنگ‌و گەلحۆ. (۳) پێڵاوی جووتیار (کە قورس‌و ناقۆڵایە).

**clodpate** (klod′pāt′), *n.* کەسێکی دەبەنگ‌و کەر.

**clodpoll, clodpole** (klod′pōl′), *n.* = **clodpate.**

**clog** (klog), *n.* (۱) شتێکی قورس کە دەبەسترێ بە دەست‌و پاشووی وولاخەوە بۆئەوەی زۆر نەجووڵێت. (۲) کۆسپ.
(۳) قاپقاپێکی ئەستوورو بەرزو قورس.
(٤) جۆرە سەمایەکە بە قاپقاپی سووکەوە دەکرێ.

*v.t.* بەرگرتنی کونێك یا بۆری‌یەك‌و ڕێ لێگرتنی ئاو یا گاز یا شلەیەکی تر کە پیایدا بڕوات؛ گرتن (بۆری، کون)؛ بەستن؛ وەستاندن؛ پەنگ پێ خواردنەوە (ئاو، زێراب).

*v.i.* (۱) بەرگیران (بۆری ئاو، کون، زێراب)؛ گیران؛ بەستن؛ پەنگ خواردنەوە.
(۲) سەماکردن.

-cloggy *(adj.).*

**clog almanac,** کاتژمێری دار: کاتژمێرێکی کۆنە بریتی‌یە لە بڕە دارێك کە گرێ یا درزی بچکۆلەی لێ هەڵدەکەنرێ بۆ پیشاندانی ڕابوردنی کات.

**clog dance,** جۆرە سەمایەکە بە قاپقاپەوە دەکرێ.

**cloister** (klois′tẽr), *n.* (۱) پەرستگا (خاچ پەرستی)؛ قەلەندەرگا.
(۲) ژیانی قەلەندەری. (۳) شوێنێك کە مرۆڤ بتوانێت بە تەنهایی تێیدا بژی.
(٤) ڕاڕەوێك لە قەلەندەرگا، کڵێسە، یا دانشگایەکدایەو لایەکی کراوەیەو پایەپایەیەو حەوشەیەك یا باخچەیەکی بەتەنیشتەوەیە.

*v.t.* دابڕین لە خەڵك‌و قەتیس کردن یا هێشتنەوە لە قەلەندەرگا یا پەرستگادا؛ بەندکردن‌و قەدەغەکردنی چوونە دەرەوەو پەیوەندی بەستن لەگەڵ خەڵکدا (بەتایبەتی ئافرەت)؛ خستنە شوێنێکی چەپەکەوەو سەربەستی چوونە دەرەوە پێ نەدان.

**cloistered** (klois′tẽrd), *adj.* گۆشەگیر؛ بە تەنها ژیاو؛ بێ پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا؛ لە جیهان دابڕاو؛ پارێزراو (لە کارتێکردنی دەرەوە)

**cloistral** (klois′trəl), *adj.* (۱) وەك قەلەندەرگا وایە؛ جیاکراوە؛ دابڕاو. (۲) دابڕاو لە قەلەندەرگایەکدا؛ بە تەنها دەژی.

**clon** (klon, klōn), *n.* = **clone.**

**clone** (klōn), *n.* (۱) چەند ڕووەکێك کە لە یەك سەرچاوەوە هاتبن، واتە کە هەموو وەچەی یەك ڕووەك بن (لەڕێی موتوربە یا پەیوەست کردنەوە).
(۲) کەسێك کە کت‌ومت لە کەسێکی تر دەچێ.

*v.i. & v.t.* درووستکردنی گیاندارێك یا ڕووەکێك یا مرۆڤێك لەڕێی زاووزێوە کە کت‌ومت لە باوك‌و دایکی بکات؛ پەیوەست کردن (مرۆڤ، گیاندار)

**clonus** (klō′nəs), *n.* کرژبوون یا لەرزینی ماسولکە.

**close** (klōs), *adj.* (۱) داخراو. (۲) دەورەدراو؛ لە ژوورەوەیە.
(۳) تەنگەبەر؛ تەنگ؛ تەسك: *( ~ quarters)* .
(٤) شاراوە: *( a ~ secret)* . (٥) پەنهانی.
(٦) دەست ناکەوێ: *( credit is ~ )* .
(۷) هەناسەبڕو بۆخەو خنکێنەر لەبەر وەستانی هەوا (ئاووهەوا).
(۸) نزیك. (۹) سفت (چنراو): *( ~ weave)* .
(۱۰) پڕ بە بەر: *( a ~ coat)* .
(۱۱) ساف؛ تەراشێکی زۆر نزیك لە پێستی دەم‌وچاوەوە: *( a ~ shave)* .
(۱۲) نزیك؛ گیانی بە گیانی: *( a ~ friend)* .
(۱۳) نزیکە لە وێنە ڕاستەقینەکەوە: *( a ~ translation)* .
(۱٤) وورد: *( ~ attention)* .
(۱٥) نزیك؛ زۆر لەیەك دەچن: *( a ~ resemblance)* .

(١٦) نزیك؛ هاوتا: *( a ~ race)* .
**adv.** لەنزیکەوە؛ بەووردی.
**close** (klōz), *v.t.* (١) داخستن (دەرگا، پەنجەرە، کون، پەرتووك، دووکان)؛ جووت کردن (دەرگا)؛ کپ کردن؛ پێوەدان (دەرگا)؛ قەپات کردن؛ سەرگرتن؛ نووقاندن (چاو)؛ قووچاندن؛ هەڵگرتن (دووکان).
(٢) دوایی پێ هێنان؛ تەواوکردن؛ بڕینەوە (گفتوگۆ، مشتومڕ)؛ داخستن.
(٣) لەبەکدان؛ پێکەوەنان یا بەستن؛ یەك پێگرتن.
**v.i.** (١) داخران؛ داخستن (٢) دوایی پێ هاتن؛ بڕانەوە.
(٣) لێ نزیکبوونەوە (بۆ نەمبازبوون یا باوەش پیاکردن).
(٤) یەکگرتن؛ لەیەك نزیکبوونەوە.
**n.** کۆتایی؛ دوایی؛ تەواو؛ تەواوبوون.
**close down,** داخستن بە یەکجاری (فرۆشگا، دەزگا، فەرمانگە، کارخانە)؛ هەڵگرتنی نێچگاری.
**close in,** ئابلووقەدان؛ تەنگ پێ هەڵچنین.
**close out,** دووکان داخستن و فرۆشتنی شتومەکەکان بە نرخی داشکاو.
**close round,** چواردەوەردان؛ ئابلووقەدان
**close up,** (١) لەیەك نزیکبوونەوە
(٢) داخستنی کاتی (دووکان، کارخانە)؛ وەستاندنی کاتی (کار، کارخانە).
(٣) ساڕێژبوون؛ چاکبوونەوە (برین).
**close** (klōs), *n.* (١) شوێنێکی دەورگیراو بە دیوار، پەرژین، یا تەلبەند.
(٢) زەمینی چواردەوری خانوویەك: *( a cathedral ~ )* .
**close call,** [Colloq.], بەناستەم ڕزگاربوون لە کارەسات یا مەترسی؛ نەوەندەی نەمابێ تووشی کارەسات ببێ.
**closed** (klōzd), *adj.* (١) داخراو؛ دەورگیراو؛ سنوور گیراو
(٢) قەدەغە (بوون بە ئەندام لە هەندێ کۆمەڵ، یانە، یا ڕێکخراودا)؛ داخراوە لە خەڵکی نەویستراو (ئەندامێتی).
(٣) تایبەتی بە شێوەیەك کە خاڵی دوایی نەبێ وەك بازنە (ئەندازە).
**close corporation,** بەشدارگەیەك کە بەشەکانی هەمووی هی چەند کەسێکن و نایفرۆشن بە کەسی ترو خۆیشیان بەشدارگەکە بەڕێوەدەبەن.
**closed chain,** زنجیری داخراو (کیمیاگەری).
**closed circuit,** پیشاندانی بەرنامەیەك لەسەر تەلەفزیۆن تەنها بۆ چەند شوێنێکی دیاریکراو (بەرنامەکە بە تەل تایبەتیدا دەنێرێ نەك بە هەوادا).
**closed shop,** کارخانەیەك کە تەنها ئەندامانی نەقابە یا یەکێتی دەتوانن کاری تێدا بکەن
**closefisted** (klōs′fis′tid), *adj.* پیسکە؛ پارەپیس؛ ڕەزیل.
**closefitting** (klōs′fit′iŋ), *adj.* پڕ بە بەر (جلوبەرگ)؛ پڕ بە پێی خۆیەتی؛ باش پێی دەکا.
**close-lipped** (klōs′lipt′), *adj.* دەم نووقاو؛ نەدوو؛ بێ دەنگ؛ نهێنی نەدرکێن
**closely** (klō′li), *adv.* (١) بە توندی؛ بە قایم (دەرگا داخستن)
(٢) تا ڕادەیەکی زۆر *( He resembles his father very ~ .)* .
(٣) بە یوحتی (کار)؛ بە باشیی و ووردیی و بێ فرووفێڵ (کار).
(٤) بە ووردیی و باشی (چاودێری کردن):
*( Watch that man ~ ; he is a thief. Watch the baby ~ .)*
**close-mouthed** (klōs′mouthd′, klōs′moutht′), *adj.* بێ دەنگ؛ دەم نووقاو؛ نەدوو؛ پەنهانی نەدرکێن.
**closeness** (klōs′nis), *n.* نزیکی (برادەرایەتی، جێگە... هتد).
**close-out** (klōz′out′), *adj.* نرخ شکاندن و فرۆشتنی هەموو شتومەك و داخستنی دووکان
**close quarters,** (١) دوا سەنگەری سەر پاپۆڕ؛ دوا شوێنی وەستان دژ بە دوژمن لەسەر پاپۆڕێك. (٢) شوێنێکی تەنگەبەر یا قەرەباڵغ؛ شەڕی دەستەویەخە.
**close shave,** [Colloq.]. بەناستەم ڕزگاربوون لە کارەسات.
**closet** (kloz′it), *n.* (١) ژوورێکی بچووکە یا بەشێکە لە ژوورێك کە جلوبەرگی تێدا هەڵدەواسرێ یا دادەنرێ. (٢) ژوورێکی بچووك بۆ خوێندنەوەو بیرکردنەوە. (٣) ژووری تایبەتی پاشا (بۆ نوێژو ڕاوێژکاری). (٤) ئاودەستخانە
**adj.** (١) تایبەتی؛ شاراوە؛ نا ئاشکرا.
(٢) بۆ خوێندنەوەو بەکارهێنانی تایبەتی نووسراوە نەك بۆ نووواندنی ئاشکرا (شانۆگەری): *( ~ drama is written only to be read, not acted.)*
**v.t.** دەرگا لەسەر خۆ داخستن بۆ ڕاوێژی تایبەتی: *( The treasurer ~ed himself with the accountants for an hour.)*
**close-up** (klōs′up′), *n.* (١) وێنەی لەنزیکەوە گیراو (وێنەی ناسایی یا لەسەر تەلەفزیۆن یا لە سینەما)؛ دیمەنی نزیك (لە وێنەدا).
(٢) لەنزیکەوە سەیرکردن
**closure** (klō′zhēr), *n.* (١) داخستن؛ داخران؛ مۆرکردن.
(٢) کۆتایی؛ کۆتایی هاتن. (٣) ئامێری داخستن.
(٤) دوایی پێ هێنانی لێدوان لەسەر مەسەلەیەك و هێنانە پێشەوەی بۆ دەنگ لەسەر دان (پەرلەمان).
**v.t.** دوایی پێ هێنانی لێدوان لەسەر مەسەلەیەك و هێنانە پێشەوەی بۆ دەنگ لەسەر دان (پەرلەمان).
**clot** (klot), *n.* تۆپەڵ؛ تۆپەڵە خوێن؛ خوێنی مەیو یا نیمچە بەستوو: *( a blood ~ )*
**v.i.** مەیین (خوێن)؛ پەیکەبەستن؛ بەستن؛ تۆپەڵ تۆپەڵ بوون و بەری بۆری خوێن گرتن.
**v.t.** بەستن (خوێن)؛ مەیاندن؛ تۆپەڵ تۆپەڵ کردن.
**cloth** (klôth, kloth), *n.* (١) قوماش (خوری، کەتان، ئاوریشم)؛ چنراو؛ کووتاڵ؛ کاڵا. (٢) پارچەیەك قوماش؛ پەڕۆ: *( tablecloth; washcloth)*
(٣) جلوبەرگی ئەندامانی پیشەیەك (قەشە، مەلا).
(٤) ئەندامانی ئەم پیشەیەو پیشەکەیش خۆی (بەتایبەتی قەشە): قەشە *( He is a man of the ~ .)*
(٥) [Obs.]، جل؛ جلوبەرگ.
(٦) قوماشی بایەوان؛ بایەوانی کەشتی بایەوان.
**adj** قوماش؛ لە قوماش دروستکراوە.
**the cloth,** قەشە؛ قەشەکان بەگشتی
**clothe** (klōth), *v.t.* (١) پۆشین.
(٢) جل لەبەرکردن؛ جلوبەرگ پێدان؛ پۆشتەکردن.
(٣) دەسەڵات پێدان لەڕێی جلوبەرگەوە: *( ~d in the dignity of his office)*
**clothes** (klōz, klōthz), *n.pl.* (١) جلوبەرگ؛ جل؛ بەرگ.
(٢) جلی سەر جێگە (وەك: چەرچەف، لێفە، پەتۆ... هتد).
**clothesline** (klōz′līn′), *n.* تەنافی جل.
**clothes moth,** مۆرانەی جل.
**clothespin** (klōz′pin′), *n.* جلگرە؛ گیرە.
**clothes pole,** ئەو دارەیە کە تەنافی جل ڕادەگرێ.
**clothes tree,** دارێکی ڕاستی سەر پەلاوییە لەسەر قنگەکەی دادەنرێ لە فەرمانگەیەك یا ماڵێکدا چاکەت و پاڵتۆو شەپقەی پێدا دەکرێ.
**clothier** (klōth′yēr), *n.* (١) جلوبەرگ فرۆش؛ بازرگانی جل؛ جلوبەرگ دروستکەر. (٢) کووتاڵ فرۆش؛ بازرگانی قوماش.
**clothing** (klōth′iŋ), *n.* (١) جل؛ جلوبەرگ؛ پۆشمنی. (٢) سەرەخەر.
**cloth yard,** یاردی کووتاڵ پێوان (سێ پێیە، واتە سی‌وشەش گرێ).
**cloture** (klō′chēr), *n.* & *v.t.* دوایی پێ هێنانی لێدوان لەسەر مەسەلەیەك لە پەرلەمانداو دەنگ لەسەر دانی.
**cloud** (kloud), *n.* (١) هەور؛ هەوروهەڵا.
(٢) ژمارەیەکی ئێجگار زۆر: *( a ~ of locusts)* .
(٣) لێڵی (ئاوێنە، ئاو). (٤) پەڵەیەکی ڕەش لە بەردی مەرمەردا.
(٥) لەکە؛ پەڵە؛ شتێکی ناپەسەند کە دەبێ بەهۆی ناخۆشی و لێڵی و تاریکی
**v.t.** (١) داپۆشین یا سەرگرتن بە هەور؛ بە هەور گرتن.
(٢) لێڵ کردن؛ تاریك کردن؛ شاردنەوە. (٣) مەترسی پەیداکردن؛ تێکدان.
(٤) لەکەدارکردن (ناوبانگ).

*v.i.* (١) هەورگرتن. (٢) لێڵ بوون؛ تێکچوون.
**in the clouds,** (١) ناکردەنی؛ کردەنی نییە؛ ناکردارەکی.
(٢) دالغەی لێداوە؛ چووەتە ژێری؛ لە خەیاڵ خەودایە؛ خەیاڵ پڵاوە.
**under a cloud,** (١) گومانی بەدکرداری لێ دەکرێ؛ گومانبار.
(٢) مات‌ومەلوول؛ غەمگین؛ پەست؛ خەفەتبار
**cloudburst** (kloud'bûrst'), *n.* لێزمەیەکی کتوپڕ؛ ڕەهێڵە؛ شەستەباران
**cloud-capped** (kloud'kapt'), *adj.* لووتکەکەی یا یۆیەکەی بە هەور گیراوە *(a ~ mountain)*.
**cloudiness** (kloud'i-nis), *n.* هەورەهەڵایی؛ بە هەور گیران.
**cloudless** (kloud'lis), *adj.* سایەقە؛ بێ هەورەهەڵا.
**cloudlet** (kloud'lit), *n.* پەڵە هەورێکی بچووک.
**cloudy** (kloud'i), *adj.* (١) هەوراوی؛ هەورەهەڵایە؛ هەورگرتوو.
(٢) (ئ) لێڵ (ئاو، شلە). (ب) لێڵ؛ تاریک. (٣) گرژ (ناوچەوان).
**clough** (kluf, klou), *n.* چەمێکی باریک
**clout** (klout), *n.* (١) [Archaic]، پەڕۆ؛ پینە *(dish-~)*.
(٢) [Colloq.]، مستەکوڵە؛ بۆکس لێدان؛ زرمە.
(٣) لێدانێکی قایم (یاری بێسبۆڵ).
(٤) پەڕۆیەک کە دەکرێ بە نیشان (تیروکەوان)؛ لێدانی ئەم نیشانە.
(٥) [Colloq.]، دەسەڵات؛ زەبر: *(He has a lot of ~. ; political ~)*.
*v.t.* (١) [Archaic]، پینەکردن.
(٢) [Colloq.]، مستەکوڵە لێدان؛ بۆکس پیاکێشان.
**clove** (klōv), *n.* (١) مێخەک. (٢) دار مێخەک.
**clove** (klōv), *archaic past tense of* **cleave**.
**clove hitch,** گرێ: جۆرە گرێیەکە بۆ بەستنی پەتێک یا گوریسێک بە دارێکەوە یا بە شتێکی ترەوە.
**cloven** (klō'v'n), *alternative past participle of* **cleave**.
*adj.* دووفاق؛ قلیشاو؛ تلیشاو.
**cloven foot,** = cloven hoof.
**cloven-footed** (klō'v'n-foot'id), *adj.* (١) سمی دووفاقە؛ سمی دووفلیقانەیە. (٢) شەیتانە؛ وەک شەیتان وایە (لەو ئەفسانەیەوەیە کە گوایە شەیتان قاچی یا سمی دووفاقە).
**cloven hoof,** سمی دووفاق (مەڕ، بزن، گا، مانگا، ئاسک... هتد): هێمای شەیتانە لە ئەفسانەدا.
**cloven-hoofed** (klō'v'n-hooft', klō'v'n-hōōft'), *adj.* (١) سمی دووفاقە (٢) شەیتانە؛ وەک شەیتان وایە (بیروباوەڕێکی ئەفسانەییە کە گوایە شەیتان قاچی یا سمی دووفاقە).
**clover** (klō'vēr), *n.* وێنجە (ئالیکی ئاژەڵ و ووڵاخ)؛ سێپەرە.
**in clover,** (١) لەوەڕەکەی خۆشە؛ لەوەڕگاکەی باشە.
(٢) تێروتەسەلە؛ خۆش گوزەرانە؛ ژیانی پڕ لە خێروخۆشییە.
**cloverleaf** (klō'vēr-lēf'), *adj.* سێپەرەیی؛ وەک گەڵای سێپەرە.
**clown** (kloun), *n.* (١) قەشمەر؛ قۆشمەچی؛ گاڵتەچی. (٢) لادێیی.
(٣) گێلۆکە؛ گەلحۆ؛ گەمژە؛ نەفام؛ بێ نەزاکەت.
*v.i.* گاڵتەبێژی کردن؛ قۆشمەچێتی کردن
**-clownery** *(n.)*.
**clownish** (kloun'ish), *adj.* (١) قەشمەر؛ قۆشمەچی؛ گاڵتەچی
(٢) گێلۆکە؛ گەلحۆ؛ بێ نەزاکەت.
**cloy** (kloi), *v.t.* زۆر خواردن و نارەحەت بوون.
**club** (klub), *n.* (١) کوتەک؛ داردەست؛ دار؛ دار حەیزەران؛ گورز.
(٢) داری یاری (گۆلف، پۆلۆ، هۆکی... هتد). (٣) یانە.
(٤) یانەی شەو: *(night ~)*. (٥) سێپەرە (یاری کاغەز یا قومار).
*v.t.* (١) بە کوتەک، گورز، یا دار لێدان.
(٢) هاوکاری کردن؛ دەستی یارمەتی درێژکردن.
(٣) لێدان بە قۆناغە تفەنگ.
*v.i.* یەکگرتن (لە یانەیەکدا).

**club car,** فارگۆنێکی شەمەندەفەر کە کورسی و خواردنەوە و شتی تری تێدا بێت.
**clubfoot** (klub'foot'), *n.* پێیەکی شێوە تێکچوو لە زگماکییەوە.
**clubfooted** (klub'foot'id), *adj.* شێوەی قاچی لە زگماکییەوە تێکچووە.
**clubhand** (klub'hand'), *n.* (١) دەستی شێوە تێکچوو لە زگماکییەوە. (٢) دەستێکی وەها تێکچوو.
**clubhouse** (klub'hous'), *n.* بارەگای یانە؛ یانە.
**clubman** (klub'mən', klub'man'), *n.* ئەندامی یانە (بەتایبەتی یەکێک کە زۆر چالاک بێت لە کاروباری کۆمەڵایەتی یانەکەدا).
**club sandwich,** ساندویچێکی ئەستوورە لە نانی برژاو و مریشک و توێژاڵە گۆشتی بەرازو کاهوو و تەماتە... هتد پێکدێت.
**club steak,** پارچە گۆشتی لاتەڕافی گا.
**cluck** (kluk), *v.i.* (١) قرتەقرت کردن (مریشک)؛ گارەگارکردن.
(٢) قرتەقرت کردن وەک مریشک (مرۆڤ).
*v.t.* (١) قرتەقرت کردن؛ بانگ کردن بە قرتەقرت.
(٢) وەک مریشک قرتەقرت کردن (مرۆڤ): *(She ~ed her disapproval.)*
*n.* (١) قرتەقرت؛ قرتە؛ گارەگار. (٢) دەنگێک کە لە قرتەقرت بچێت.
**clue** (klōō), *n. Also* **clew,** نیشانە؛ شتێکە کە یارمەتی لێکدانەوەی مەسەلەیەکی گیروگرفتاوی دەدات (ووتە، سەر لەقاندن، کردەوە... هتد)؛ کلیلی هەڵهێنانی مەتەڵێک یا شتێکی شاراوە.
*v.t.* ( ~ in ), کلیلی هەڵهێنانی مەتەڵێک یا شتێکی شاراوە پێدان؛ درکاندنی نەختاڵێک لە شتێکی نهێنی و شاراوە بۆئەوەی هەموو نهێنییەکە هەڵبهێنرێ.
**clumber** (klum'bēr), *n. Also* **clumber spaniel,** جۆرە سەگێکی خرینی تۆکمەی تووک سپییە.
**clump** (klump), *n.* (١) تۆپەڵ. کلۆ (خاک)؛ گلمتک؛ کەرسەک: *(a ~ of earth)*
(٢) کۆمەڵێک بنچک یا دارودرەخت.
(٣) تەپەتەپی پێ؛ تەپەتەپ؛ تەپە؛ زرمە.
*v.i.* (١) بە تەپەتەپ ڕۆیشتن بەڕێوە.
(٢) تۆپەڵ بوون؛ گردبوونەوە و بوون بە تۆپەڵ؛ کۆمەڵ بوون؛ خڕبوونەوە
*v.t.* (١) ناشتنی کۆمەڵێک دارودرەخت یا ڕووەک پێکەوە.
(٢) تۆپەڵ کردن؛ گردکردنەوە؛ کۆمەڵ کردن؛ خڕکردن.
**clumpish** (klump'ish), *adj.* قورس و ناقۆڵا.
**clumpy** (klump'i), *adj.* (١) پڕ لە گلمتک، کلۆ، یا کەرسەک (زەوی).
(٢) کۆمەڵ؛ وەک کۆمەڵە دارودرەخت. (٣) قورس و ناقۆڵا.
**clumsily** (klum'zə-li), *adv.* گەوجانە؛ حۆلانە؛ ناقۆڵایانە؛ نەزانانە؛ جلفرانە؛ بە خواروخێچی؛ بە گێژانە؛ گێلانە.
**clumsiness** (klum'zi-nis), *n.* گەوجی؛ حۆلی؛ ناقۆڵایی؛ نەزانی؛ جلفری؛ خواروخێچی؛ گێژی؛ گێلی.
**clumsy** (klum'zi), *adj.* (١) حۆل؛ گەوج؛ ناقۆڵا؛ نەزان (ڕەووشت، کردەوە)؛ جلفر؛ خواروخێچ؛ گێژ؛ گێل. *(a ~ person)*.
(٢) ناقۆڵا؛ باش درووست نەکراو؛ ناڕێک: *(a ~ chair)*.
(٣) نابەجێ؛ ناپەسەند؛ نادرووست: *(a ~ excuse)*.
**clung** (kluŋ), *past tense and past participle of* **cling**.
**clupeid** (klōō'pi-id), *n.* چەند جۆرە ماسییەکی پەڕەکە نەرمە (وەک ساردین).
**cluster** (klus'tēr), *n.* (١) هێشوو (ترێ)؛ بۆڵ.
(٢) پڕ یا کۆمەڵ (مرۆڤ، گیاندار، شتومەک).
*v.i. & v.t.* کۆمەڵ بوون؛ گردبوونەوە؛ خڕبوونەوە؛ کۆمەڵ کردن؛ گردکردنەوە؛ خڕکردنەوە.
**clutch** (kluch), *v.t.* (١) گرتن (بە چنگ، بە دەست)؛ چنگ پیاکردن؛ پڕپیاکردن؛ قڕاندن. (٢) بەتوندی بەدەستەوە گرتن و بەرنەدان.
*v.i.* ( ~ at ), چنگ پیاکردن؛ پەلاماردان؛ پڕپیاکردن؛ قڕاندن؛ بە دەست یا

بە چنگ گرتن

*n.* (١) چنگ؛ چرنووك؛ دەست (لە کاتی پڕپیاکردن یا گرتندا).
(٢) (*pl.*) دەسەلات (ناپەسەند)؛ زەبر: *( the ~es of imperialism)*
(٣) گرتن؛ بە دەست گرتنێك؛ بەتوندی گرتنێك. (٤) کلاچ (ئوتومبیل).
(٥) پایدەری کلاچ کارپێکردن (٦) [Slang]. ناکاوی؛ فریاکەوتن.

**clutch** (kluch), *v.t.* هەڵهێنان (جووجك، هێلکە).
*n.* (١) هێلانەیەکی پڕ لە هێلکە
(٢) کۆمەڵێك هێلکە یا جووجك کە پێکەوە هەڵهێنرابن.

**clutter** (klut'ēr), *n.* نارێك‌وپێکی و شت بەسەریەکدا کەوتن‌و کەڵەکە بوونیان بەسەر یەکدا (ژوور، مال، فەرمانگە، شەقام، مێز)؛ پیس‌وپۆخڵی؛ شێواوی
*v.t.* ( ~ up ), شت بەسەریەکدادان‌و کەڵەکەکردنیان بە نارێك‌وپێکی؛ تێکدان؛ پیس‌وپۆخڵ کردن؛ بە پیس‌وپۆخڵی ڕاگرتن؛ بەسەریەکدا شێواندن.
*v.i.* بە جریوانەو سەر لێ شێواوی کارکردن‌و جووڵانەوە.

**clypeus** (klip'i-əs), *n.* چوکلەیەکی وەك قەڵغان وایە بەسەر سەری هەندێ مێرووەوەیە.

**clyster** (klis'tēr), *n.* حوقنە؛ شاف.

**co-** (kō), پێشکۆیەکە بەمانای: (١) پێکەوە؛ لەگەڵ
( co-exist; co-operate; co-education )
(٢) هاوبەش؛ پێکەوە: ( co-owner; co-author ).
(٣) تەواوکەر (ئەندازە): ( complement )

**coach** (kōch), *n.* (١) عەرەبانەی ئەسپ.
(٢) فارگۆنی شەمەندەفەر (هی ڕێبوار یا ئەفەر) (٣) پاس.
(٤) ئوتومبێلێکی دوو دەرگا
(٥) نمرە یا چۆنێتی هاتوچۆی هەرزان بە فڕۆکە یا شەمەندەفەر.
(٦) فێرکەری تایبەتی (کە قوتابییەك فێردەکات‌و ئامادەی دەکات بۆ تاقیکردنەوە؛ مامۆستای تایبەتی (٧) ڕاهێنەر یا مەشق پێکەری وەرزشی (تیپی وەرزشی پیشەیی، زانکۆ، قوتابخانە).
*v.t.* (١) هەڵگرتن یا گواستنەوە (بە عەرەبانە، پاس، یا فارگۆنی شەمەندەفەر).
(٢) فێرکردن و ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوە؛ مەشق پێکردن.
(٣) مەشقی وەرزشی پێکردن.
*n.* (١) سواری عەرەبانە، پاس، یا فارگۆنی شەمەندەفەر بوون
(٢) بوون بە مامۆستای تایبەتی یا ڕاهێنەری وەرزشی.

**coach-and-four** (kōch'ən-fôr'), *n.* عەرەبانەی چوار ئەسپی

**coach dog,** *Also* Dalmation, جۆرە سەگێکی باریکەڵەی بەڵەکی تووك کورتە. ئەم ناوەی لێنراوە چونکە زوو وا ڕادەهێنران کە بەتەنیشت عەرەبانەوە ڕابکەن).

**coacher** (kōch'ēr), *n.* (١) ڕاهێنەر یا مەشق پێکەری وەرزشی؛ مامۆستای تایبەتی؛ فێرکەری تایبەتی. (٢) ئەسپی عەرەبانە.

**coachman** (kōch'mən), *n.* (١) عەرەبانچی
(٢) جۆرە مێشێکی دەستکردە بۆ داونانەوەو ڕاوەماسی بەکاردەهێنرێ.

**coaction** (kō-ak'shən), *n.* زۆرکاری؛ زۆرەملی؛ زۆرداری

**coactive** (kō-ak'tiv), *adj.* بە زۆرداری؛ بە زۆرەملی

**coactive** (kō-ak'tiv), *adj.* پێکەوە کاردەکەن؛ پێکەوە چالاکن؛ پێکەوە ڕوودەدەن

**coadjutant** (kō-aj'ə-tənt), *adj.* یاریدەی یەکتر دەدەن؛ هاوکاری دەکەن
*n.* یاریدەدەر

**coadjutor** (kō-aj'ə-tēr, kō'ə-jōō'tēr), *n.* (١) یاریدەدەر
(٢) یاریدەدەری قەشە

**coadunate** (kō-aj'yoo-nit, kō-aj'yoo-nāt'), *adj.* (١) یەك گرتوو (٢) پێکەوە نووساو (ڕووەکناسی، زیندەوەرزانی).

**coagulate** (kō-ag'yoo-lāt'), *v.t.* مەیاندن (خوێن، شلە)؛ بەستن
*v.i.* مەیین (خوێن، شلە)؛ بەستن؛ پەیکە بەستن.

**coagulation** (kō-ag'yoo-lā'shən), *n.* (١) مەیین (خوێن، شلە)؛ بەستن. (٢) تۆپەڵێکی مەییو (خوێن، پەنیر، ماست).
-coagulator *(n.).*

**coagulum** (kō-ag'yoo-ləm), *n.* تۆپەڵێکی مەییو (خوێن، پەنیر، ماست، شیر).

**coal** (kōl), *n.* (١) خەڵووز؛ زووخاڵ؛ خەڵووزی دار
(٢) خەڵووزی بەردین. (٣) پشکۆ؛ سکڵ
*v.t.* (١) کردن بە خەڵووز؛ سووتاندن. (٢) خەڵووز پێدان.
*v.i.* خەڵووز هێنان‌و کەڵەکەکردن.
carry coals to Newcastle, هێنانی شتێك بۆ شوێنێك کە لەو شوێنە خۆیدا زۆروزەبەنە بێت (" نیوکاسڵ" ناوچەیەکە لە ئینگلتەرە کە بە خەڵووز بەناوبانگە).
haul (or rake, drag, call) over the coals, سەرزەنشت کردن؛ شکاندن (مرۆڤ).
heap coals of fire on (a person's) head, خراپەی کەسێك بە چاکە گەڕانەوەو والێکردنی کە پەشیمان‌و تەریق بێتەوە.

**coal car,** شەمەندەفەری خەڵووز (بۆ گواستنەوەی لە کانەوە بۆ شوێنی مەبەست).

**coaler** (kōl'ēr), *n.* (١) پاپۆڕ یا شەمەندەفەری خەڵووز گواستنەوە.
(٢) فرۆشیاری خەڵووز.

**coalesce** (kō'ə-les'), *v.i.* (١) ساڕێژبوونەوە (دوو ئێسقانی شکاو، برین). (٢) یەکگرتن؛ بوون بەیەك؛ تێکەڵاوبوون؛ کۆمەڵ بوون.
-coalescence *(n.)*; coalescent *(adj.).*

**coal field,** ناوچەیەك کە خەڵووزی بەردینی زۆر بێت.

**coal gas,** (١) گازی خەڵووز (کە لە خەڵووز دەردەهێنرێ).
(٢) گازی خەڵووز (کە پەیدا دەبێت لە سووتاندنی خەڵووزو گازێکی ژەهراوییە

**coal heaver,** کرێکاری خەڵووزی بەردین.

**coaling station,** شوێنی خەڵووز بارکردن (لەسەر پاپۆڕو شەمەندەفەر).

**coalition** (kō'ə-lish'ən), *n.* (١) یەکێتی؛ یەکگرتن.
(٢) پێکهاتن یا یەکگرتنی کۆمەڵ‌و بەرە ڕامیارییەکان لە وڵاتێکدا بۆ ڕووخاندنی ڕژێمێك یا پێکهێنانی ڕژێمێکی تازەو حوکمڕانی وڵاتەکە.

**coal mine,** کانی خەڵووز؛ کانگەی خەڵووزی بەردین.

**coal oil,** (١) نەوت؛ بەنزین. (٢) نەوتی خاو.

**coal pit,** (١) کانی خەڵووزی بەردین. (٢) چاڵی خەڵووزی دار.

**coal tar,** قیری خەڵووز.

**coaly** (kōl'i), *adj.* (١) پڕ لە خەڵووز؛ خەڵووزاوی (٢) ڕەش.

**coaming** (kōm'iŋ), *n.* (١) لێوارێکی بەرز بەدەوری کونی سەربانێك یا دیوارێکدا. (٢) لێوارێکی بەرز بەدەوری کونی خۆ شۆڕکردنەوە بۆناو پاپۆڕێك (بۆئەوەی ئاو لە کونەکەوە نەچێتە ناو پاپۆڕەکەوە).

**coaptation** (kō'ap-tā'shən), *n.* ساڕێژبوونەوە (دوو ئێسقانی شکاو، برین)؛ پێکەوە گونجان.

**coarse** (kôrs, kōrs), *adj.* (١) هەڕەمەکی؛ ڕەشۆکی؛ بازاری؛ خراپ
(٢) درشت (ساوەر، لم): *( ~ sand)*
(٣) زبر (قوماش، تەختە): *( ~ cloth)* .
(٤) کەرتڕ؛ بێ ئەزاکەت؛ ناپەسەند (کردەوە): *( a ~ joke)* .

**coarse-grained** (kôrs'grānd', kōrs'grānd'), *adj.* (١) زبر؛ درشت. (٢) کەرتڕ؛ بێ ئەزاکەت؛ بێ ماریفەت

**coarsen** (kôr's'n, kōr's'n), *v.t.* زبرکردن؛ درشت کردن.
*v.i.* زبربوون؛ درشت بوون.

**coast** (kost), *n.* (١) کەناری دەریا. (٢) [Obs.] ، سنووری وڵاتێك.
(٣) لێژایی؛ شوێنێکی سەرەولێژ (٤) قنگەخلیسکێ.
*v.i.* (١) گەشت کردن بە بەلەم بەتەنیشت کەناری دەریاوە.
(٢) هاتوچۆکردن لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی تر (مرۆڤ، پاپۆڕ، بەلەم).
(٣) قنگەخلیسکێ کردن. (٤) بەردەوام بوون لە بزووانندا بەهۆی گوڕخواردن‌و تەووژمەوە یا هێزی ڕاکێشانەوە ئەگەرچی مەکینەش کوژابێتەوە بەتایبەتی لە سەرەوخوارکەیەکدا کە دەتوانرێ گێڕی بۆش بەکاربهێنرێ.

(٥) بە لامسەرلایی دانەبەر؛ هیچ هەوڵو تەقەلایەك نەدان.
*v.t.* گەشت کردن بە بەلەم بەتەنیشت کەناری دەریاوە.
**the Coast,** [Colloq.]. کەنار زەریای پاسیفیك لە ئەمەریکا؛ کەنار زەریای رۆژئاوای ئەمەریکا.
**the coast is clear,** مەترسی هیچ نەماوە: ئەو کەسە یا شتەی مەترسی لێ دەکرا لێرە نەماوەو رۆیشتووە.
**coastal** (kōs'tʼl), *adj.* کەنار دەریایی؛ کەنار دەریا.
**coastal plain,** زەوی تەخت بە درێژایی کەناری دەریاو بەتەنیشتییەوە.
**coast artillery,** تۆپی کەناری دەریا. ئەو لقەی هێزی چەکداری وڵاتێکە کە ئەرکی پاراستنی بەندەرکانو کەنار دەریای پێ سپێردراوە.
**coaster** (kōs'tẽr), *n.* (١) بکەری coast (مرۆڤ، شت)
(٢) پاپۆڕێکە کە خەڵك یا شتومەك دەگوێزێتەوە لە بەندەرێکەوە بۆ بەندەرێکی تر لەسەر کەناری دەریا. (٣) [Obs.]. سینییەکە کە لەسەر چوارچێوەیەکی پێچکەدار قایم کراوە بۆ پیاناردنی خواردنەوەو شتی تر بۆ ئەو کەسانەی کە دانیشتوون لە ژووری میوان. (٤) پارچە دار، شوشە، پلاستیك یا مقەبایەکە بنەکەی نەرمە دەخرێتە سەر مێزێكو پەرداخو سووراحیو کووپی لەسەر دادەنرێ بۆ پاراستنی مێزەکە لە رووشاندنو گەرمی. (٥) هێڵێکی شەمەندەفەرە کە سەرەوخوارەو سەرەوژوورەی زۆر تێدایە شەمەندەفەری بە خێرایی پیا دەڕوات (لە باخچەی گەشتوگوزاردا).
**coaster brake,** ئیستۆپی دواوەی پاسکیل.
**coast guard,** (١) هێزی پاسەوانی کەناری دەریا (کە هێزێکی نیمچە سەربازییە). (٢) ئەندامێکی ئەم هێزە
**coast line,** بە لای یا قەراغی کەناری دەریادا؛ بەتەنیشتی کەناری دەریاوە.
**coastward** (kōst'wẽrd), *adj. & adv.* بەرەو کەناری دەریا.
**coastwards** (kōst'wẽrdz), *adv.* = **coastward.**
**coastways** (kōst'wāz), *adv.* = **coastwise.**
**coastwise** (kōst'wīz'), *adv. & adj.* بە لای یا قەراغی کەناری دەریادا؛ بەتەنیشتی کەناری دەریاوە
**coat** (kōt), *n.* (١) چاکەت؛ پاڵتۆ
(٢) بەرگی سرووشتی گیاندار (وەك: پێست، خوری، تووك، توێخ).
(٣) دیوی دەرەوەی رووەکێك یا پێستەکەی؛ توێخ.
(٤) [Obs.]. جلوبەرگێك کە پلەوپایەی کۆمەڵایەتی ئەو کەسە دەردەخات.
(٥) چین؛ توێ؛ دەست (بۆیاخی ماڵ یا ئوتومبیل)؛ قات.
*v.t.* (١) چاکەت لەبەرکردن؛ چاکەت پێدان.
(٢) داپۆشین بە چینێك یا توێیەك شیرینی (نوقڵە بادەمی)؛ دەستێك یا قاتێك بۆیاخ لێدان
**coated** (kōt'id), *adj.* (١) چینێك یا قاتێك شیرینی لێدراوە (نوقڵە-بادەمی). (٢) ماددەیەکی بریقەداری لێدراوە (کاغەز).
**coatee** (kōt'ē'), *n.* چاکەتێکی کورت
**coati** (kō-ä'ti), *n.* گیاندارێکی شیردەری هەمووشت خۆری کێوییە ئەوەندەی پشیلەیەك دەبێتو لە " ڕاکوون " دەچێت بەڵام کلكو لووتی درێژترە.
**coating** (kōt'iŋ), *n.* (١) ماددەیەکە کە بدرێت لە ڕوویەك بۆ جوانی یا پاراستن؛ چین؛ قات. *(a ~ of enamel)*.
(٢) قوماشی چاکەت دروستکردن.
**coat of arms,** درووشمی خانەدانی یا سوارچاکی: قەڵغانێکە کە نیشانەی تایبەتی هۆز یا تیرەیەکی پێوەیە؛ نیشانەی بەگزادەیی.
**coat of mail,** قەڵغانێکە لە ئەڵقەی بەیەکداچووی کانزا دروستکراوە.
**coattail** (kōt'tāl'), *n.* (١) پاشەڵ (چاکەت، جلوبەرگ).
(٢) تلیشێکی چاکەتی دووتلیش.
**coauthor** (kō-ô'thẽr), *n.* هاودانەر (پەرتووك، وتار)؛ هاونووسەر؛ یارمەتیدەری نووسەر.
**coax** (kōks), *v.t.* (١) مەرایی بۆ کردن؛ کلکەلەقێ بۆ کردن.
(٢) مرۆڤ سازکردن بە مەراییو کلکەلەقێ تاکو ئەوەی دەتەوێ بیکات:
*(She ~ed him into buying her a car.)*
*v.i.* مەرایی کردن؛ کلکەلەقێ کردن؛ پشی پشی کردن.

**coaxial** (kō-ak'si-əl), *adj.* یەك تەوەرەیان هەیە؛ لەسەر یەك تەوەرەن.
**coaxial cable,** تەلی یەك تەوەرە (تەلەفۆن، تەلەگراف، تەلەفزیۆن).
**cob** (kob), *n.* (١) کوڵۆ (خەڵووز) (٢) گوڵە گەنمەشامی.
(٣) نێرەی قاز. (٤) ئەسپێکی تۆکمەی کورتەباڵا.
**cobalt** (kō'bôlt'), *n.* کۆباڵت: کانزایەکە ڕەنگی لە زیو دەچێت
**cobalt blue,** (١) خومێکی شینی سەوزباوە. (٢) ڕەنگی شینی سەوزباو.
**cobble** (kob'ʼl), *v.t.* (١) پێڵاو پینەکردن.
(٢) چاکردن یا پینەکردن بە ناقۆڵایی.
**cobble** (kob'ʼl), *n.* (١) خڕە بەرد. (٢) (*pl.*)، کوڵۆ خەڵووز
*v.t.* بەردڕێژکردن: بەکارهێنانی خڕە بەرد بۆ بەردڕێژکردنی شەقامو کۆڵان لەبری قیرتاوکردن.
**cobbler** (kob'lẽr), *n.* (١) خواردنەوەیەکی ساردی سەرخۆشکەرە لە شەرابو ئاوی میوەی مزرەمەنیو شەکر دروست دەکرێت. (٢) شیرینییەکە لە میوە (بەتایبەتی سێو یا قۆخ)و شەکرو توێژاڵە هەویرو ئەختالێك دارچینی دروست دەکرێو لە فڕندا دەپێشێنرێ.
**cobbler** (kob'lẽr), *n.* (١) پینەچی؛ کەوشدروو.
(٢) کرێکارێکی نەزانی قەڵب کە هەرچی شتێك بکات تێکی دەدات.
**cobblestone** (kob'ʼl-stōn'), *n.* خڕە بەردێکە شەقامو کۆڵانی پێ بەردڕێژ دەکرێ لەبری قیرتاوکردن.
**cob coal,** کوڵۆ خەڵووز.
**cobelligerent** (kō'bə-lij'ẽr-ənt), *n.* وڵاتێك کە لە پاڵ وڵاتێکی تر یا چەند وڵاتێکدا دژی هاودوژمنی هەموولا جەنگ دەکات.
**cobnut** (kob'nut'), *n.* (١) بوندوق: کاکڵەیەکە لە بستە دەچێت.
(٢) درەختێك کە ئەم بەرە دەگرێت.
**cobra** (kō'brə), *n.* (١) کۆبرا (مار)؛ ئەژدیها.
(٢) قایشێك کە لە پێستی ئەم مارە دروست دەکرێت.
**cobweb** (kob'web'), *n.* (١) هێلانەی جاڵجاڵۆکە.
(٢) تاڵێکی هێلانەی جاڵجاڵۆکە (٣) شتێکی ناسکی کرێشەیی یا لە داو چوو (وەك هێلانەی جاڵجاڵۆکە) (٤) پیلانێکی ئاڵۆز.
(٥) (*pl.*)، (ا) کەڵەکەبوونی شتو ڕەنگو بۆنی کۆن لێ نیشتن لە ئەنجامی بەکارنەهێنان یا خستنە پشت گوێدا. (ب) شێواوی؛ تێکەڵوپێکەڵی *( ~ in the brain)*
*v.t.* بە هێلانەی جاڵجاڵۆکە یا شتێکی وەها داپۆشین.
-**cobwebby** *(adj.)*.
**coca** (kō'kə), *n.* (١) کۆکا: ڕووەکێکی ئەمەریکای خوارووە گەڵاکەی ماددەی " کۆکاین " ی لێ دەردەهێنرێ. (٢) گەڵای ووشك کراوی ئەم ڕووەکە
**cocaine, cocain** (kō-kān', kō'kān), *n.* کۆکاین: ماددەیەکی سڕکەرە لە گەڵای ووشك کراوەی ڕووەکی " کۆکا " دەردەهێنرێ (بۆ کەیفو بەنج کردن بەکاردەهێنرێ).
**cocainism** (kō-kān'iz'm), *n.* خووگرتن بە بەکارهێنانی کۆکاینەوە.
**cocainize** (kō-kān'īz), *v.t.* سڕکردن بە ماددەی کۆکاین.
**coccidiosis** (kok-sid'i-ō'sis), *n.* نەخۆشییەکە تووشی ڕیخۆڵەو گەدەی گیاندارو باڵندەی ماڵی دەبێت
**coccus** (kok'əs), *n.* (١) بەکتریای خڕ.
(٢) قاشە میوەیەکە بە دەنك یا تۆوێکەوە کە لە قاشەکانی تری ئەو میوەیە جیا دەبێتەوە لەکاتی گەییندا.
-**coccus** (kok'əs), پاشکۆیەکە بەمانای: بەکتریای خڕ.
**coccyx** (kok'siks), *n.* کلێنچکە.
**cochlea** (kok'li-ə), *n.* بەشی پێچ لوولی گوێی ناوەوە (کە جەمسەری دەماری بیستنی تێدایە)
-**cochlear** *(n.)*.
**cochleate** (kok'li-āt'), *adj.* پێچ لوول (وەك هێلکە شەیتانۆکە)
**cock** (kok), *n.* (١) کەڵەشێر؛ کەڵەباب. (٢) نێرەی باڵندە.
(٣) خوێندنی کەڵەشێر. (٤) باکەڵەشێر (دامۆڵێکە ڕووی هەڵکردنی با پیشان دەدات). (٥) سەرۆك؛ پێشرەو؛ سەردەستە. (٦) دەمەوانە؛ بەلوعە.

(٧) پەلەپیتکە (دەمانچە، تفەنگ)؛ پیتك. (٨) لەسەرپێ بوونی چەکێك.
(٩) [Slang]. کێر. (١٠) چاو خوارکردنەوە یا هەڵبڕین
(١١) قەراغی کڵاو یا شەپقە بەرزکردنەوە یا خستن بەلادا.
*v.t.* (١) خستن بەلادا (کڵاو، شەپقە).
(٢) گوێ رەپکردن *(A dog ~s his ears.)*
(٣) گوێ قوڵاغ کردن (ئەسپ، کەر)؛ چاو تێ بڕین.
(٤) دەمانچە یا تفەنگ هێنانە سەرپێ
*v.i.* رەپ بوون؛ لاربوونەوە.

**cock** (kok), *n.* خەرمانێکی قووچەکی؛ مەلۆ یا کۆمەڵە پووشێکی قووچەکی
*v.t.* کۆمەڵ کردن بە شێوەی قووچەك (پووش).

**cockade** (kok-ād′), *n.* گوڵێك یا چەند شریتێکی رەنگینی گرێ دراو کە دەکرێت بە شەپقەوە وەك پۆپنەی کەڵەشێر

**cock-a-doodle-doo** (kok′ə-doo′d′l-dōō′), *n.* (١) قووقەی کەڵەشێر؛ خوێندنی کەڵەشێر. (٢) کەڵەشێر.

**cock-a-hoop** (kok′ə-hōōp′), *adj.* (١) شەید؛ شاد؛ شادمان.
(٢) فتەحی؛ فشەکەر؛ خۆهەڵکێش؛ لەخۆبایی.

**cockalorum** (kok′ə-lôr′əm, kok′ə-lō′rəm), *n.* (١) کەڵە شێرێکی بچووك. (٢) پیاوێکی بچووك کە خۆی زۆر بە زل بزانێ؛ کەسێکی لەخۆبایی. (٣) فشە.

**cockamamie, cockamamy** (kok′ə-mam′ik), *adj.* (١) هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ. (٢) قەڵب؛ ساختە
(٣) قسەی قۆڕو بێ مانا؛ قسەی هیچ‌وپووچ.

**cock-and-bull story,** حیکایەتێکە کە نەچێتە مێشکەوە؛ فشە؛ قسەیەك کە جێی بڕواپێکردن نەبێت

**cockateel, cockatiel** (kok′ə-tēl′), *n.* تووتییەکی بچووکی ئوستورالی‌یە

**cockatoo** (kok′ə-tōō′), *n.* تووتییەکی گەورەی رەنگاورەنگی پۆپنە بەرزە

**cockatrice** (kok′ə-tris), *n.* مارێکی ئەفسانەیی‌یە گوایە ئەگەر سەیری هەرچ شتێك بکات دەیکوژێت (گوایە لە هێلکەی کەڵەشێر بووە).

**cockboat** (kok′bōt′), *n.* بەلەمێکی بچووك (بەتایبەتی کە خەڵك بگوێزرێتەوە لە پاپۆڕێکی گەورەوە بۆ کەناری دەریا).

**cockchafer** (kok′chāf′ēr), *n.* قالۆنچەیەکی گەورەیە رووەك دەخوات و دەیفەوتێنێ.

**cockcrow** (kok′krō′), *n.* بەرەبەیان؛ کاتی خوێندنی کەڵەشێر.

**cocked hat,** (١) شەپقەیەکی سێ سووچ (کە لێوارەکەی لە سێ لاوە هەڵگەڕابێتەوە. (٢) شەپقەیەکە لێواری پێشەوەو دواوەی تیژ بێ‌و قووچکەیەکی هەبێت

**knock into a cocked hat,** [Slang]. لەناوبردن؛ فەوتاندن؛ تێکشکاندن

**cocker** (kok′ēr), *n.* = cocker spaniel.

**cocker** (kok′ēr), *v.t.* نازکێشان؛ نازپێدان؛ بەدەمەوەدان.

**cockerel** (kok′ēr-əl, kok′rəl), *n.* کەڵەشێرێکی بچووك

**cocker spaniel,** سەگێکی بچووکی گوێ شۆڕی تووك ئاوریشمی‌یە.

**cockeye** (kok′ī′), *n.* چاوێکی خێل

**cockeyed** (kok′īd′), *adj.* (١) خێل؛ چاو خێل
(٢) [Slang]. خواروخێچ؛ لار. (٣) [Slang]. ناچێت بە مێشکدا؛ نابەجێ.
(٤) [Slang]. سەرخۆش.

**cockfight** (kok′fīt′), *n.* شەڕە کەڵەشێر

**cockfighting** (kok′fīt′iŋ), *n.* شەڕە کەڵەشێر.

**cockhorse** (kok′hôrs′), *n.* ئەسپە دارینە

**cockiness** (kok′i-nis), *n.* لەخۆبایی بوون؛ کەشخەچێتی.

**cockish** (kok′ish), *adj.* لەخۆبایی؛ کەشخەچی

**cockle** (kok′'l), *n.* (١) گیاندارێکی ئاوی‌یە دوو قاوغی وەك دڵی هەیە (٢) قاوغی ئەم گیاندارە ئاوی‌یە. (٣) بەلەمێکی بچووك‌و سووك
(٤) چرچ؛ قەد.
*v.i. & v.t.* چرچ بوون؛ چرچ کردن؛ قەدکردن.

**cockles of one's heart,** پەڕەی دڵ؛ ناخی دڵ

**cockle** (kok′'l), *n.* بژار یا گژوگیای ناو دەغڵ‌ودان.

**cockleboat** (kok′'l-bōt′), *n.* = cockboat.

**cockleshell** (kok′'l-shel′), *n.* (١) قاوغی گیاندارێکی ئاوی بچووك. (٢) بەلەمێکی سووك‌و بچووك.

**cockney** (kok′ni), *n.* (١) کۆکنی: کەسێکی خەڵکی گەڕەکی خۆرهەڵاتی شاری " لەندەن " کە بە بێ دەرامەتی ناسراوە.
(٢) کۆکنی: زاری خەڵکی ئەم ناوچەیەی شاری " لەندەن "
(٣) دانیشتوویەکی شاری " لەندەن " (بۆ سووکی یا پێکەنین).
*adj.* (١) وەك " کۆکنی " یا زارەکەیان.
(٢) وەك هی " لەندەن " یا دانیشتووانی.

**cock of the walk,** سەردەستە؛ سەرگەورە؛ سەرۆکی تاقم؛ سەردار.

**cockpit** (kok′pit′), *n.* (١) مەیدانی شەڕە کەڵەشێر.
(٢) مەیدانی جەنگ: شوێنێکە کە گەلێك جەنگ تیایدا روویداوە.
(٣) ژوورێکە لە پاپۆڕێکی جەنگیدا بۆ حەوانەوەی ئەفسەرو دەرمانکردنی برینداری جەنگ بەکاردەهێنرێ. (٤) ژووری لێخوڕینی پاپۆڕ.
(٥) ژووری فڕۆکەوان‌و یاریدەدەرکانی لەناو فڕۆکەیەکدا.

**cockroach** (kok′rōch′), *n.* سیسرك.

**cockscomb** (koks′kōm′), *n.* (١) پۆپنەی کەڵەشێر.
(٢) کڵاوی قۆشمەچی (کە لە پۆپنەی کەڵەشێر دەچێت).
(٣) جۆرە رووەکێکە (گوڵەکەی لە پۆپنەی کەڵەشێر دەچێت).

**cockshut** (kok′shut′), *n.* [Obs. or British Dial.]. تاریك‌و ڕوونی ئێوارە.

**cockshy** (kok′shī′), *n.* (١) نیشان گرتن؛ هاویشتن یا فڕێدان بەرەو نیشانێك (یارییەکی کۆنە بریتی‌یە لە شت هاویشتنە کەڵەشێرێکی بەستراوە بە دارەوە ئەو کەسەی کە لێی بدات کەڵەشێرەکە دەباتەوە). (٢) نیشان

**cocksure** (kok′shoor′), *adj.* (١) زۆر دڵنیا. (٢) لەرادەبەدەر دڵنیا.

**cockswain** (kok′s'n, kok′swān′), *n.* = coxswain.

**cocktail** (kok′tāl′), *n.* (١) کۆکتێل: خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری تێکەڵاوە. (٢) مەزە (بەتایبەتی هی گۆشتی گیانداری ئاوی کە ترش یا خۆشاوی بەسەردا دەکرێت): *(a shrimp ~)*.
(٣) ئەسپێکی کلك قرتاو. (٤) ئەسپێکی دووڕەگ.

**cocky** (kok′i), *adj.* [Colloq.]. لەخۆبایی؛ کەشخەچی.

**coco** (kō′kō), *n.* (١) دارگوێزی هیندی. (٢) گوێزی هیندی.
*adj.* لە توێکڵ‌و توێکی گوێزی هیندی درووستکراوە.

**cocoa** (kō′kō), *n.* (١) کاکاو: ئاردی دەنکی کاکاوی هاڕراو.
(٢) خواردنەوەی کاکاو. (٣) قاوەیی (رەنگ)

**cocoanut** (kō′kə-nut′), *n.* = a coconut.

**coconut** (kō′kə-nut′), *n.* گوێزی هیندی.

**coconut palm (or tree),** دارگوێزی هیندی.

**cocoon** (kə-kōōn′), *n.* (١) قۆزاخە. (٢) قاوغ یا بەرگێکی پارێزەر.

**cocotte** (kō′kot′, kə-kot′), *n.* ئافرەتێکی سووك؛ قەحبە.

**cod** (kod), *n.* کۆد: جۆرە ماسی‌یەکی دەریایی‌یە.

**cod** (kod), *n.* (١) [Archaic]، کیسە.
(٢) [Dial.]؛ توێك؛ قاوغ (فاسۆلیا).

**coda** (kō′də), *n.* دوا ئاوازی پارچەیەك مۆسیقا.

**coddle** (kod′'l), *v.t.* (١) کوڵاندنی لەسەرخۆ (وەك هێلکە لەناو ئاوێکدا کە نەهاتبێتە کوڵ). (٢) نازکێشان؛ نازپێدان؛ ناز ڕاگرتن.

**code** (kōd), *n.* (١) یاسا؛ دەستوور.
(٢) دەستوور؛ دەستووری ژیان: *(the military ~; a moral ~)*
(٣) پەرلە؛ شفرە.
*v.t.* (١) ڕێکخستن لە شێوەی یاسا یا دەستووردا.

(٢) شفرە بۆ دانان؛ کردن بە پەرلە

**code name,** ناوی نهێنی؛ ناوی پەرلە

**codefendant** (kō´di-fen′dənt), *n.* داوا لەسەرکراوی دووەم؛ گوماندراوی دووەم

**codeine** (kō′di-ēn´, kō′dēn), *n.* کۆدین: دەرمانێکی ئازارە لە ئەفیون دروست دەکرێت.

**codex** (kō′deks), *n.* (١) دەستنووسی پەرتووکێکی کلاسیکی یا ئینجیل (٢) [Archaic]، یاسا؛ کۆمەڵە یاسا؛ دەستوور.

**codfish** (kod′fish´), *n.* = **cod.**

**codger** (koj′ẽr), *n.* [Colloq.]. کەسێکی نائاسایی؛ کەسێکی پیر

**codicil** (kod′ə-s'l, kod′ə-sil´), *n.* (١) پاشکۆی وەسیەتنامە. (٢) پاشکۆ

**codify** (kod′ə-fī´, kō′də-fī´), *v.t.* (١) کۆکردنەوەو ڕێکخستن یا پۆل پۆل کردنی یاسا. (٢) کردن بە یاسا

**-codification** *(n.)*; **codifier** *(n.).*

**codling** (kod′liŋ), *n.* (١) بەچکە ماسی " کۆد " (کە جۆرە ماسییەکی دەریاییە (٢) جۆرە ماسییەک کە لە " کۆد " دەچێت.

**codling** (kod′liŋ), *n. Also* **codlin,** (١) جۆرە سێوێکە (٢) سێوێکی کاڵو کرچ، واتە نەگەییو. (٣) سێوێکی بچووک‌و خراپ.

**codling (or codlin) moth,** کرمی سێو، هەرمێ، بەهێ.

**cod-liver oil,** ڕۆن گورچیلەی ماسی " کۆد " (دەرمانی بەهێزکردنی خوێنە)

**coed, co-ed** (kō′ed´), *n.* [Colloq.]. قوتابی کچ لە ڕانکۆ یا دانشگایەکی تێکەڵاودا.

***adj.*** خوێندنی تێکەڵاو (کوڕو کچ).

**coeducation** (kō´ej-oo-kā′shən), *n.* خوێندنی تێکەڵاو؛ خوێندنی کوڕو کچ پێکەوە.

**coeducational** (kō´ej-oo-kā′shən'l), *adj.* تێکەڵاو، تایبەتی بە خوێندنی کوڕو کچ پێکەوە لە قوتابخانە یا زانکۆدا: *( a ~ college)* .

**coefficient** (kō´ə-fish′ənt), *adj.* هاوکاریکەر

***n.*** هاوکۆلکە

**-coele** (sēl), برگەیەکە بەمانای: بۆشایی.

**coelenterate** (si-len′tẽr-āt´), *n.* گیاندارێکی ناوی بێ بڕبڕاگەی پشتە کە بەباتی کۆئەندامی هەرس بۆشاییەکی وەک کیسەی هەیە.

**coelenteron** (si-len′tẽr-on´), *n.* بۆشایی وەک کیسەی ناوەوەی گیانداری ناوی بێ بڕبڕاگەی پشت.

**coeliac** (sē′li-ak´), *adj.* هی بۆشایی گەدە.

**coelom** (sē′ləm), *n.* بۆشایی ناولەشی هەندێ گیاندار

**coequal** (kō-ē′kwəl), *adj. & n.* هاوتا؛ یەکسان؛ هاوپلە؛ هاوپایە.

**coerce** (kō-ũrs′), *v.t.* زۆرلێکردن؛ بەزۆر پێکردن؛ بە زۆرەملێ کردن؛ زۆرداری کردن

**coercion** (kō-ũr′shən), *n.* زۆرلێکردن؛ زۆرداری؛ زۆرەملێ.

**coercive** (kō-ũr′siv), *adj.* زۆرکاری؛ زۆرکار

**coessential** (kō´ə-sen′shəl), *adj.* هەمان سرووشتیان هەیە.

**coetaneous** (kō´i-tā′ni-əs), *adj.* هاوچەرخ؛ هاوتەمەن.

**coeternal** (kō´i-tũr′n'l), *adj.* ئەمرز وەک یەک؛ هەتا هەتا پێکەوە دەژین

**coeval** (kō-ē′v'l), *adj.* هاوچەرخ؛ هاوتەمەن

**coexist** (kō´ig-zist′), *v.i.* پێکەوە ژیان‌و هەڵکردن لە هەمان چەرخو شوێندا؛ یا بەتەنیشت یەکەوە (دوو وڵات، ڕێکخراو، مرۆڤ، یا بیروباوەڕ)

**coexistence** (kō´ig-zis′təns), *n.* (١) پێکەوە ژیان‌و هەڵکردن لە هەمان چەرخو شوێندا یا بەتەنیشت یەکەوە (دوو وڵات، ڕێکخراو، مرۆڤ، یا بیروباوەڕ) هاوگوزەرانی (٢) بە ئاشتی ژیانی دوو وڵات پێکەوە لەگەڵ جیاوازی قووڵی بیروباوەڕیاندا.

**-coexistent** *(adj.).*

**coextend** (kō´ik-stend′), *v.t. & v.i.* ئەوەندەی یەک درێژبوونەوە لە کات‌و شوێندا.

**-coextension** *(n.)*; **coextensive** *(adj.).*

**coffee** (kôf′i, kof′i), *n.* (١) قاوە (خواردنەوە) (٢) قاوە (دەنک یا تۆو). (٣) ڕووەک یا درەختی قاوە.

***adj.*** تایبەتی بە قاوە (تام یا ڕەنگ)؛ قاوە.

**coffee bean,** تۆو یا دەنکی قاوە

**coffee break,** پشووی قاوە خواردنەوە (پشوویەک لە کاردا کە قاوە یا خواردنەوەی تری تێدا دەخورێتەوە).

**coffeecake** (kôf′i-kāk´, kof′i-kāk´), *n.* کێکی قاوە (کە مێوژو گوێزی تێدایەو لەگەڵ قاوەدا دەخورێت).

**coffeehouse** (kôf′i-hous´, kof′i-hous´), *n.* قاوەخانە؛ چایخانە.

**coffee mill,** ئامێر یا مەکینەی هاڕینی قاوەی برژاو.

**coffeepot** (kôf′i-pot´, kof′i-pot´), *n.* قۆری قاوە؛ جزۆ

**coffee shop,** چێشتخانەیەکە کە قاوەو چەند جۆرە خواردەمەنییەکی تێدا دەست دەکەوێت.

**coffee table,** مێزی قاوە: مێزێکی نزمی بچووکە لە ژووری میواندا قاوە، چا، هەروەها خواردنەوەی ترو میوەی لەسەر دادەنرێت؛ تەپلەک.

**coffee tree,** دار قاوە؛ درەختی قاوە

**coffer** (kôf′ẽr, kof′ẽr), *n.* (١) قاسە؛ سندووقێکی کانزایی قایمە شتی بەنرخی تێدا هەڵدەگیرێ. (٢) *(pl.)*، خەزێنە؛ خەزنە. (٣) تابلۆیەکی ڕازاوەیە لە بنمیچ یا کووەمێزێکدا. (٤) **cofferdam** .

**cofferdam** (kôf′ẽr-dam´, kof′ẽr-dam´), *n.* (١) بەنداوی ئاوبڕ (کە لەناو ڕووبارێکدا بەکاردەهێنرێ بۆ ئاوبڕین لەو شوێنەی پایەی پردێکی تێدا دروست دەکرێت. (٢) سندووقی ئاوبڕ (کە بە قەراغی پاپۆڕێکەوە توند دەکرێ بۆ چاکردنەوەی بەشی ژێر ئاوی پاپۆڕەکە).

**coffin** (kôf′in, kof′in), *n.* (١) دارتەرم؛ تەرم؛ تابووت (٢) چاڵایی سمی ئەسپ.

***v.t.*** (١) خستنە ناو دارتەرمەوە. (٢) بەستنەوە

**coffin bone,** ئێسقانی ناو سمی ئەسپ‌و گیانداری تری وەها.

**coffle** (kof′'l), *n.* کاروانی بەند یا گیاندار کە پێکەوە بەسترابنەوە لەکاتی گواستنەوەدا؛ قافڵە.

**cog** (kog), *n.* (١) ددانی پێچکەیەک کە لە ددانەکانی تری پێچکەکە دەگیرێ‌و پێچکەکە دەخولێنێتەوە. (٢) پێچکەیەکی ددانداری (پاسکیل). (٣) [Colloq.]، کەسێکی بچووک یا ناگرنگ لە دەزگایەکی گەورەدا.

**cog** (kog), *v.t. & v.i.* (١) گزی کردن لە هەڵدانی زاردا (تاوڵە، قومار). (٢) ساختەکردن؛ فێڵ‌وتەڵەکەکردن؛ خەڵەتاندن.

***n.*** [Obs.]. (١) گزی لە هەڵدانی زاردا (تاوڵە، قومار). (٢) ساختە؛ فێڵ‌وتەڵەکە؛ خەڵەتاندن.

**cogency** (kō′jən-si), *n.* هێزی پێ سەلماندن (لە بیروباوەڕ یا لێکۆڵینەوە یا نووسین یا باسێکدا).

**cogent** (kō′jənt), *adj.* پێ سەلمێنەر (بیروباوەڕ، لێکۆڵینەوە، نووسراو، باس، لێدوان).

**cogged** (kogd), *adj.* دداناوی (پێچکە)؛ پێچکەی دداناوی هەیە.

**cogitate** (koj′ə-tāt´), *v.i.* لێکۆڵینەوە؛ بیرکردنەوە.

***v.t.*** لێکۆڵینەوە؛ بیرلێکردنەوە

**cogitation** (koj´ə-tā′shən), *n.* (١) بیر. (٢) بیرلێکردنەوە؛ لێکۆڵینەوە

**cogitative** (koj′ə-tā´tiv), *adj.* بیرکەرەوە.

**cognac** (kō′nyak, kon′yak), *n.* کۆنیاک: (١) جۆرە براندییەکی فەرەنسییە لە ناوچەی " کۆنیاک " لە فەرەنسا دروست دەکرێت (٢) براندی: جۆرە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە.

**cognate** (kog′nāt), *adj.* (١) خزم؛ هاوبنچینە؛ هاوسەرچاوە. (٢) هاوسەرچاوە؛ هاوبنچینە (ووشە، زمان).

[ **English** ***apple*** **and German** ***apfel*** **are ~ words. ; French and Spanish are ~ languages.** ]

(۳) هاوسرووشت؛ لەیەك دەچن.

***n.*** (۱) خزم، مرۆڤ. (۲) دوو ووشە لە دوو زمان یا زیاتردا کە دەنگو مانایان لەیەك بچێتو لە هەمان بنچینەوە هاتبن (بۆ نموونە: ئەبرۆ: **brow**؛ ئەژنۆ: **genou**؛ پێ: **ped**؛ دوو: **two**)

**cognation** (kog-nā′shən), ***n.*** خزمایەتی؛ لە هەمان سەرچاوە یا بنچینەوە هاتن

**cognition** (kog-nish′ən), ***n.*** (۱) زانین؛ فێربوون؛ هەستپێکردن؛ ناسین (۲) شتێکی زانراو یا هەستپێکراو.

**cognitive** (kog′nə-tiv), ***adj.*** تایبەتی بە فێربوون یا زانین (توانای مێشکی).

**cognizable** (kog′ni-zə-b'l, kon′i-zə-b'l), ***adj.*** (۱) دەتوانری بزانرێت، فێربێت، یا هەستی پێ بکرێت (۲) لەژێر دەسەڵاتی دادگایەکدایە.

**cognizance** (kog′ni-zəns, kon′i-zəns), ***n.*** (۱) هەستپێکردن؛ زانین (۲) سەرنج؛ ئاگاداربوون (۳) مەودای فێربوون یا زانین لەڕێی سەرنج دانەوە (٤) نیشانەیەکی جیاکەرەوە (٥) ماف یا دەسەڵاتی دادگایەك بۆ لێکۆڵینەوەی دوایەك؛ لێکۆڵینەوەی داوایەك لەلایەن دادگاوە

**take cognizance of,** ئاگاداربوون؛ زانین؛ بینین؛ دان نان بە بوونی شتێکدا

**cognizant** (kog′ni-zənt, kon′i-zənt), ***adj.*** ئاگادارە؛ دەزانێت.

**cognize** (kog′nīz′), ***v.t.*** ئاگاداربوون؛ پێزانین؛ هەستپێکردن.

**cognomen** (kog-nō′mən), ***n.*** (۱) ناوی باووباپیری کەسێك (لە رۆمای کۆندا) (۲) ناوی باووباپیر؛ لەقەب (۳) نازناو؛ ناو

**-cognominal** *(adj.).*

**cognoscente** (kō′nyō-shen′te), ***n.*** زانا؛ شارەزا

**cognoscible** (kog-nos′ə-b'l), ***adj.*** cognizable.

**cognovit** (kog-nō′vit), ***n.*** دان پیانانی نووسراوی داوالێکراو بە گوناهەکەیدا لە دادگا

**cogwheel** (kog′hwēl′), ***n.*** پێچکەی دداناوی کە ددانەکانی لە ددانی پێچکەیەکی تر یا زنجیرێك گیردەبێتو دەبێتە هۆی خولانەوە، وەك پاسکیل).

**cohabit** (kō-hab′it), ***v.i.*** پێکەوە ژیان وەك ژنو مێرد (بەتایبەتی بەبێ مارەبڕین؛ هاوجێیی کردن.

**cohabitant** (kō-hab′ə-tənt), ***n.*** کەسێك کە هاومالی کەسێکی تر بکات وەك ژنو مێرد بەبێ ئەوەی مارەیییان برابێت لەیەکتری؛ هاوجێ.

**cohabitation** (kō-hab′ə-tā′shən), ***n.*** پێکەوە ژیانی دوو کەس وەك ژنو مێرد بەبێ ئەوەی مارەیییان برابێت لەیەکتری؛ هاوجێیی کردن.

**coheir** (kō-âr′), ***n.*** میراتبەر؛ میراتگر؛ بەشداری میرات

**coheiress** (kō-âr′is), ***n.*** میراتبەری مێینە؛ میراتگرێکی ژن یا کچ

**cohere** (kō-hēr′), ***v.i.*** (۱) پێکەوەلکان؛ پێکەوەنووسان (۲) پێکەوە گونجان یا مانا بەخشین (نووسراو، بیروڕا، چیرۆك).

**coherence** (kō-hēr′əns), ***n.*** (۱) پێکەوەلکان؛ پێکەوەنووسان. (۲) لەگەل یەکدا گونجان یا مانا بەخشین (نووسراو، بیروڕا، چیرۆك):

***( His story lacked ~ .)***

**coherency** (kō-hēr′ən-si), ***n.*** = **coherence.**

**coherent** (kō-hēr′ənt), ***adj.*** (۱) پێکەوەلکاو؛ پێکەوەنووساو (۲) لەگەل یەکدا دەگونجێت یا مانا دەبەخشێت (نووسراو، بیروڕا، چیرۆك).

**cohesion** (kō-hē′zhən), ***n.*** (۱) پێکەوەلکان؛ پێکەوەنووسان (۲) بەکگرتن گەردی ماددە—فیزیا (۳) پێکەوە گونجانو مانا بەخشینو ڕێكوپێکی (نەخشە، بیروڕا، کار).

**cohesive** (kō-hē′siv), ***adj.*** (۱) پێکەوەلکاو؛ پێکەوەنووساو (۲) لەگەل یەکدا گونجاوو مانابەخشو بوونو ڕێكوپێك.

***( The government does not have a ~ policy.)***

**cohort** (kō′hôrt), ***n.*** (۱) پەل سوپای ڕۆمای کۆن؛ کۆمەڵە سەرباز (۲) تاقم؛ کۆمەل (۳) هاوکار؛ یاریدەدەر

***( The mayor came with one of his ~s.)***

**coif** (koif), ***n.*** (۱) کڵاو. (۲) کڵاو یا شەپقەیەکی سپی پارێزەرانی بەرزی ئینگلتەرە لە کۆندا. (۳) پلەی پارێزەری بەرز لە ئینگلتەرە.

**coiffeur** (kwä-fūr′), ***n.*** دەلاك؛ سەرتاش.

**coiffure** (kwä-fyoor′), ***n.*** (۱) کڵاو. (۲) قژ داهێنانێکی تایبەتی.

**coign, coigne** (koin), ***n.*** قوژبن یا سووچێکی دەربۆقیو.

**coign of vantage,** جێگەیەکی باش بۆ چاودێری یا کارکردن.

**coil** (koil), ***v.t.*** هەڵکردن (پەت، گوریس)؛ لوولدان؛ پێچ پێدان؛ با پێدان.

***v.i.*** (۱) پێچ خواردن (پەت، گوریس)؛ پەپکەخواردن (مار)؛ لوول بوون. (۲) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن وەك مار.

***n.*** (۱) پێچ خواردن؛ پەپکەخواردن؛ ئەڵقەخواردن. (۲) شتێك کە پێچ یا ئەڵقەی خواردبێت؛ تەلێکی لوول خواردو یا پێچاوپێچ. (۳) یەکێك لەو ئەڵقانە؛ پێچێك. (٤) کۆمەڵە بۆرییەکی پێکەوە بەستراوی ڕیزکراو یا پێچاوپێچ. (٥) کۆیلی ئوتومبیل.

**coil** (koil), ***n.*** [Archaic], هەراوهوریا؛ هەرا؛ ئاشووب

**coin** (koin), ***n.*** (۱) بەردی بناغە؛ بەردی گۆشە؛ پواز. (۲) پارەی وورده؛ وورده (۳) [Slang]، پارە؛ دراو؛ سکە.

***v.t.*** (۱) پارەی وورده دەرکردن؛ سکەلێدان. (۲) داتاشین یا داڕشتن (ووشە، زاراوە)؛ داهێنان (ووشە، زاراوە).

***v.i.*** پارەی وورده دەرکردن؛ سکەلێدان.

**coin money,** [Colloq.], پارە زۆر بە خێرایی پەیداکردن؛ سکەلێدان؛ سەرکەوتووبوونی دارایی

**pay (a person) back in his own coin,** لەگەل کەسێکدا جووڵانەوە بەوڕێیەی لەگەڵتدا دەجووڵێتەوە.

**coinage** (koin′ij), ***n.*** (۱) پارەی وورده دەرکردن؛ سکەلێدان. (۲) پارەی وورده. (۳) مافی سکەلێدان. (٤) ووشەیەکی داتاشراو یا داڕێژراو؛ داتاشین یا داڕشتنی ووشەو زاراوە

**coincide** (kō′in-sīd′), ***v.i.*** (۱) لێکچوون؛ جووت بوون؛ دەقاودەق بوون. (۲) هاوکات؛ ڕوودان لە هەمان کاتدا؛ ڕێکەوتن (کاتی ڕوودان):

***( His arrival ~s with yours.)***

(۳) گونجان یا ڕێکەوتن لەگەل یەکتردا (بیروڕا، ویست، مەیل):

***( Our interests ~ .)***

**coincidence** (kō-in′sə-dəns), ***n.*** (۱) لێکچوون؛ دەقاودەق؛ وەك یەك بوون. (۲) گونجان یا ڕێکەوتن لەگەل یەکدا (۳) ڕوودانی دوو شت لە هەمان کاتدا. (٤) ڕێکەوت.

**coincident** (kō-in′sə-dənt), ***adj.*** (۱) ڕووداو لە هەمان کاتدا؛ لە هەمان کاتو شوێندایە. (۲) گونجاو؛ دەقاودەق؛ وەك یەکن:

***( His hobby is ~ with his vocation.)***

(۳) ڕێکەوت.

**coincidental** (kō-in′sə-den′t'l), ***adj.*** = **coincident.**

**coiner** (koin′ēr), ***n.*** (۱) پارەی وورده دروستکەر (پارەی ساختە). (۲) داهێنەر.

**coinheritor** (kō′in-her′ə-tēr), ***n.*** = **coheir.**

**coinsurance** (kō′in-shoor′əns), ***n.*** بیمەی دوولایەنە یا هاوبەش (کە کۆمپانیییەكو خاوەن زەویوزار یا شتی تر پێکەوە لێپرسراوی بیمەی ئەو زەویوزارە یا شتە بن).

**coir** (koir), ***n.*** توێكو پووشی گوێزی هیندی کە دەکرێ بە گوش.

**coition** (kō-ish′ən), ***n.*** جووت بوون؛ گان.

**coitus** (kō′i-təs), ***n.*** جووت بوون؛ گان.

**coke** (kōk), ***n.*** کۆك؛ خەڵووزی کۆك.

**coke** (kōk), ***n.*** (۱) کۆکاین. (۲) کۆکا؛ کۆکاکۆلا.

***v.t.*** [Slang], ( ~ **up** ), کۆکاین پێدان؛ کارتێکردن بە کۆکاین پێدان.

**col** (kol), ***n.*** دەربەند.

**cola** (kō′lə), ***n.*** کۆلا (خواردنەوەیەکە لە تۆوی داری " کۆلا " دروست

دەکرێت)؛ کۆکاکۆلا

**cola** (kō′lə), *n. plural of* **colon.**

**colander** (kul′ən-dėr, kol′ən-dėr), *n.* دەفرێکە بنەکەی کون

کونە سەوزەی تێدا دەشۆرێتەوەو شتی تیا دەچۆڕێنرێتەوە؛ پاڵێوگ.

**colchicum** (kol′chi-kəm, kol′ki-kəm), *n.* (١) ڕووەکێکی

گوڵدارە وەك زەنبەق وایە. (٢) تۆوو قەدی ژێر زەوی ئەم ڕووەکە کە چارەسەری

نەخۆشی ڕۆماتیزمی پێ دەکرێت.

**cold** (kōld), *adj.* (١) سارد؛ سەرما؛ ساردوسڕ؛ بێ تین.

(٢) مردوو؛ سڕ

(٣) هەست مردوو؛ خوێن سارد؛ دوورەپەرێز: *( a ~ person)*

(٤) سارد؛ نابەدڵ؛ وشك *( a ~ reception)*

(٥) ناخۆش؛ دڵشکێن:

*( They had a ~ realization of their plight.)*

(٦) بێ لایەن؛ بێ مەبەستو هەستی خۆیی: *( ~ logic)*.

(٧) ڕەنگی سارد (وەك هەندێ ڕەنگی شین، سەوز، یا بۆر).

(٨) بێ مەیل؛ خوێن سارد؛ بێ هەستو هەوەسی جووت بوون.

(٩) [Slang]، بێ هۆش *( The boxer was knocked ~ .)*

(١٠) بۆن کز (ڕاوکردن)

*n.* (١) ساردی؛ ساردوسەرمایی؛ بێ تینی. (٢) سەرمابوون؛ سەرما.

(٣) هەڵامەت

**catch (or take) cold,** هەڵامەت گرتن؛ هەڵامەت تووش بوون.

**cold comfort,** ئاسوودەیی نادات بە دڵ؛ ئاسوودە نەبەخش.

**have cold feet,** [Colloq.], وورە بەردان؛ ترسان؛ نەوێران

**give (a person) the cold shoulder,** بە ساردی یا وشکی لەگەڵدا

جووڵانەوە؛ گوێ پێ نەدان.

**in the cold,** گوێ پێ نەدراو؛ خراوە لاوە؛ بێ ئاگا.

**throw cold water on,** ساردکردنەوە؛ بە ساردی گرتن.

**coldblooded** (kōld′blud′id), *adj.* (١) پلەی گەرمی لەشی بەپێی

دەوروبەرەکەی دەگۆڕێت (خشۆك، ماسی... هتد):

*( Fishes and reptiles are ~ animals.)*

(٢) سەرمابردەڵە

(٣) دڵڕەق؛ بێ بەزەیی؛ بێ ڕەحم

**cold chisel,** ئەسکەنەی سارد: کە لە پۆڵای ئاودراو دروست دەکرێتو

کانزای ساردی پێ دەبڕێت

**cold frame,** چوارچێوەی سارد: چوارچێوەیەکی شووشەی بێ گەرمییە

شەتڵی بچووکی تێدا دەپارێزرێت

**cold front,** بەرەی سارد: هەوای سارد کە بەرەو ناوچەی گەرم هەڵدەکات.

**cold-hearted** (kōld′här′tid), *adj.* بێ بەزەیی؛ بێ هەست؛

دڵڕەق؛ بێ ڕەحم

**cold pack,** (١) بەتانیو حاولی تەڕی سارد کە لە نەخۆشەوە دەپێچرێت بۆ

چارەسەرکردنی. (٢) شێوەیەکی خواردەمەنی کردنە قوتووەوەیە (لەپێشەوە

خواردەمەنییەکە بە خاوی یا ساردی دەکرێتە ناو قوتووەکەوەو دوای ئەوە

گەرم دەکرێتەوە)

**cold-shoulder** (kōld′shōl′dėr), *v.t.* [Colloq.]. بە ساردی یا

وشکی لەگەڵدا جووڵانەوە؛ گوێ پێ نەدان.

**cold shoulder,** [Colloq.], گوێ پێ نەدانی دەسەنقەست؛

بە ساردی یا وشکی لەگەڵدا جووڵانەوە:

*( She gave her former friend the ~ .)*

**cold snap,** ماوەیەکی کورتو لەپڕی ئاووهەوای سارد

**cold sore,** زیپکەیەك کە لە دەمو لێو دێت (بەتایبەتی لەکاتی هەڵامەت یا

لەرزوتادا)

**cold steel,** چەکی پۆڵایین (وەك: چەقۆ، ڕم، شیر... هتد)

**cold storage,** هەڵگرتنی خواردەمەنیو شتی تر لە شوێنی سارددا.

**cold turkey,** [Colloq.], خۆکشانەوەی یەکسەرو تەواو لە شتێك کە

خووی پێوەگیرابێت (وەك خواردنەوەی سەرخۆشکەر، دەرمان، جگەرە... هتد).

**cold sweat,** ئارەق کردنەوەیەکە لەرزو سڕبوونی لەگەڵدایە (لەکاتی ترس

یا دڵ داخورپاندا).

**cold war,** شەڕەقسەی نێوان دوو وڵات یا بەرە؛ شەڕەدەمو ناکۆکی

ڕامیاری، پڕوپاگەندە، ڕاگەیاندنو ئابووری نێوان دوو وڵات کە لەوانەیە ببێتە

هۆی ڕوودانی شەڕی تەواو.

**cold wave,** شەپۆلی سارد: ماوەیەك کە ئاووهەوا ساردتر بێت لە ئاسایی.

**cole** (kōl), *n.* یەکێکە لە چەند جۆرە ڕووەکێك وەك کەلەرم.

**colectomy** (kə-lek′tə-mi), *n.* دەرهێنانی ڕیخۆڵە کوێرە یا بەشێکی

بە نەشتەرگەری.

**coleslaw** (kōl′slô′), *n. Also* **cole slaw,** زەڵاتەیەکە لە کەلەرمی

جنراو دروست دەکرێت.

**coleus** (kō′li-əs), *n.* ڕووەکێکی ئەفەریقایییە گەڵاکانی ڕەنگاوڕەنگە.

**colic** (kol′ik), *n.* (١) ژانەسکی منداڵی شیرەخۆرە.

(٢) گریانو نووزانەوەی منداڵ بەهۆی ئەم ژانەسکەوە.

*adj.* تایبەتی بە ژانەسك.

**colicky** (kol′ik-i), *adj.* (١) سك ئێشەیی؛ وەك سك ئێشە.

(٢) سك ئێشەی لەگەڵدایە (منداڵی ساوا).

(٣) دەبێت بەهۆی سك ئێشە.

**colicroot** (kol′ik-rōōt′, kol′ik-root′), *n.* جۆرە ڕووەکێکە خۆی

یا ڕەگەکەی دەرمانی سك ئێشەی لێ دروست دەکرێت.

**coliseum** (kol′ə-sē′əm), *n.* (١) [C-] ، یاریگای گەورەی بەناوبانگی

ڕۆمای کۆن. (٢) یاریگایەکی گەورە؛ خانوویەکی گەورە کە وەرزشی تێدا

دەکرێت.

**colitis** (kō-lī′tis), *n.* هەوکردن یا داگیرسانی پەردەی ڕیخۆڵە کوێرە.

**collaborate** (kə-lab′ə-rāt′), *v.i.* (١) هاوکاری کردن (بەتایبەتی لە

کردنی کارێك یا بەرهەمێکی هونەری یا وێژەیی یا زانستی

(٢) هاوکاری کردن لەگەڵ دوژمندا.

**collaboration** (kə-lab′ə-rā′shən), *n.* (١) هاوکاری کردن

(لە نووسینی پەرتووکێك یا بەرهەمێکی هونەریدا)

(٢) هاوکاری کردن لەگەڵ دوژمندا.

**collaborationist** (kə-lab′ə-rā′shən-ist), *n.* هاوکاریکەری

دوژمن: کەسێکە کە هاوکاری لەگەڵ داگیرکەری وڵاتەکەیدا بکات.

**collaborator** (kə-lab′ə-rā′tėr), *n.* هاوکاریکەری کەسێك یا

چەند کەسێکی تر لە نووسینی پەرتووکێك، کارێکی هونەری یا زانستیدا

**collage** (kə-läzh′), *n.* کۆلاژ: هونەرێکە بریتییە لە پێوەنووساندنی

شتی هەمەجۆرە بە جیوە وەك: پارچەی ڕۆژنامە، وێنە، قوماشو گوڵو شتی

تری وەها بە تابلۆیەکەوە بە شێوەیەکی گونجاو یا نەگونجاو.

**collagen** (kol′ə-jen′), *n.* کۆلاجین: ماددەیەکی جەلاتینی جیوەییە

لە ئێسقانو کرکراگەو تێشووی لەشدا هەیە.

**collapse** (kə-laps′), *v.i.* (١) ڕووخان؛ ڕمان؛ هەرەس هێنان؛ تەپین؛

تلیسانەوە؛ کەوتن.

(٢) شکان؛ تێکشکان: *( The enemy's defenses ~d.)*.

(٣) بەلاداهاتن؛ بەلاداکەوتن (مرۆڤ لەبەر خراپی باری تەندرووستی).

(٤) نووشتانەوە (کورسی، مێز).

*v.t.* خستن؛ ڕووخاندن؛ نوشتانەوە

*n.* (١) ڕووخان؛ تلیسانەوە؛ هەرەس هێنان؛ تەپین؛ کەوتن.

(٢) ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن (بازرگانی، دەزگای پیشەسازی یا کڕینو فرۆشتن)

(٣) سەرنەگرتن؛ ڕووخان (گفتوگۆ).

(٤) بەلاداهاتن؛ بەلاداکەوتن (مرۆڤ لەبەر خراپی باری تەندرووستی)

**collapsible** (kə-lap′sə-b′l), *adj.* دەنووشتێترێتەوە (کورسی، مێز)

**collar** (kol′ėr), *n.* (١) ملیوان؛ یەخە (کراس، چاکەت).

(٢) شتێك کە وەك ملوانکە بۆ جوانی بکرێتە مل.

(٣) قایشی ملی سەگ؛ ڕست (بۆ ملی سەگو تانجی).

(٤) قایشی بەرملی ئەسپو ماین (کە بەشێکە لە زین).

(٥) ئەڵقەی پێوەبەستنی دوو بۆری. (٦) خاڵی مل (هەندێ باڵندەو گیاندار).

(٧) کەفی سەر پەرداخی بیرە

**v.t.** (١) قایش لە مل کردن؛ ملیوان لێنان (٢) دەست بەسەردا گرتن؛ داگیرکردن.
(٣) [Colloq.] مل گرتن؛ وەستاندن و قسە لەگەڵ کردن.
*(She ~ed him in the hall.)*

**collarbone** (kol′ēr-bōn′), *n.* ئێسقانی چەنەمە؛ چەنەمە.

**collard** (kol′ērd), *n.* جۆرێکە لە کەلەرم

**collaret, collarette** (kol′ēr-et′), *n.* ملیوانێکی بچووکە لە فەروو یا ئاوریشم... هتد.

**collate** (ko-lāt′, kol′āt), *v.t.* (١) بەراووردکردنی پەرتووک بەووردی لەگەڵ یەکتریدا (٢) لێ ووردبوونەوەو پیاچوونەوەی پەرەکانی پەرتووکێک بۆ دڵنیابوون لە رێکوپێکی پێش لە بەرگ گرتنی (٣) ریزکردن و جیاکردنەوەو رێکوپێک کردن (مەکینەی زیرۆکس) (٤) دانانی قەشە بە مووچە
(٥) لێ ووردبوونەوەی پەرتووکێک پەرە بە پەرە بۆ دڵنیابوون کە هیچ پەرەیەکی ناتەواو نییە

**collateral** (kə-lat′ēr-əl), *adj.* (١) هاورێک؛ تەریب؛ بەتەنیشت یەک
(٢) لەگەڵبەندیە؛ تەواوکەر (٣) ناسەرەکی.
(٤) چوونیەک لە سرووشت و بابەتدا
(٥) لە هەمان بنچینەیە؛ بۆرە خزم.
(٦) دەستەبەری قەرز (لەسەرروو دەستەبەری ئاسایییەوە)؛ بارمتە:
*(a ~ loan)*

**n.** (١) بۆرە خزم (٢) سەرمایەیەک کە دەستەبەری قەرزێکی پێ دەکرێ (وەک خانوو)؛ بارمتە

**collation** (ko-lā′shən, kə-lā′shən), *n.* (١) بەراووردکردنی پەرتووک لەگەڵ یەکتریدا (٢) ریزکردن و رێکوپێک کردنی پەرەکانی پەرتووکێک.
(٣) کورتە ناسێکی ناوەرۆکی پەرتووکێک (وەک ژمارەی پەرەکانی، ژمارەی وێنەکان... هتد) (٤) دانانی قەشەیەک بە مووچە (٥) کۆبوونەوەی رۆژانەی ووشکەسۆفییەکانی پەرستگایەک (بۆ گوێگرتن لە خوێندنەوەی ئایینی).
(٦) ژەمێک خواردنی سووک لە کۆتایی رۆژانی بەرۆژووبووندا.
(٧) ژەمێک خواردنی سووک.

**colleague** (kol′ēg), *n.* هاوکار؛ هاوپیشە؛ ئاوەڵ؛ هەڤاڵ.

**collect** (kə-lekt′), *v.t.* (١) کۆکردنەوە؛ گردکردنەوە؛ خڕکردنەوە؛ چنینەوە؛ کۆمەڵ کردن (٢) کۆکردنەوە (پوول، پەرتووک، وێنە) بۆ کەیف و هۆگری (٣) کۆکردنەوە؛ گرتن یا وەرگرتن (باج، کرێ).
(٤) هاتنەوەسەرخۆ؛ هێمن بوونەوە؛ خۆ گورج کردنەوە

**v.i.** (١) کۆبوونەوە؛ گردبوونەوە؛ خڕبوونەوە (٢) کۆمەڵ بوون
(٣) وەرگرتن؛ گردکردنەوە (کرێ).

**adj. & adv.** پارەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە تەلەفۆنەکەی بۆ دەکرێت:
*(He telephoned ~. ; a ~ call)*

**collect** (kol′ekt), *n.* نوێژێکی کورت

**collectanea** (kol′ek-tā′ni-ə), *n.pl.* هەڵبژاردە ووتار، هەڵبەست: کۆمەڵە هەڵبەست یا ووتارێکی نووسەرێک یا زیاتر کە پێکەوە لە پەرتووکێکدا بڵاوکرابنەوە

**collected** (kə-lek′tid), *adj.* (١) کۆکراوە؛ خڕکراوە؛ کۆمەڵ کراو
(٢) هێمن؛ لەسەرخۆ

**collection** (kə-lek′shən), *n.* (١) کۆکردنەوە؛ خڕکردنەوە؛ گردکردنەوە (٢) کۆمەڵ (مرۆڤ، شت)؛ هەند؛ تاقم *(a ~ of stamps)*
(٣) کۆمەڵ؛ تۆپەڵ *(a ~ of dust)*
(٤) باربوو؛ پیتاک؛ دەقنە

**collective** (kə-lek′tiv), *adj.* (١) گشتی؛ هەموویی
(٢) کۆمەڵی؛ پێکەوە *(a ~ decision ; a ~ leadership)*.
(٣) هەرەوەزی؛ کۆمەڵە، کار.
(٤) ناوی کۆ (رێزمان)؛ ناوێکی تاکە کە کۆ دەگەیەنێت (وەک class, army, orchestra, crowd)

**n.** (١) کارێکی هەرەوەزی؛ کۆمەڵەی هەرەوەزی
(٢) ئەندامانی کۆمەڵەیەکی هەرەوەزی وەها. (٣) ناوی کۆ (رێزمان).

**collective bargaining,** گفتوگۆی بە کۆمەڵ: لەنێوان خاوەن کارو نوێنەری کرێکاران یا یەکێتی کرێکاراندا دەربارەی مووچەو ماوەی کارو باری گشتی کار.

**collective farm,** کێڵگەی هەرەوەزی.

**collectively** (kə-lek′tiv-li), *adv.* بەگشتی؛ بە کۆمەڵ؛ هەموو؛ پێکەوە.

**collective security,** ئاسایشی گشتی: پەیمانی نێوان وولاتان بۆ پاراستنی ئاسایشی جیهان لەرێی سزادانی ئەو وولاتەی هێرش دەباتە سەر وولاتێکی تر.

**collectivism** (kə-lek′tiv-iz′m), *n.* سۆشیالیزم: خاوەنێتی و بەرێوەبردنی هۆی بەرهەم لەلایەن گشت گەلەوە یان میری کە نوێنەرێتی.

-collectivist *(n.)*; collectivistic *(adj.)*.

**collectivity** (kol′ek-tiv′ə-ti), *n.* (١) کۆمەڵ؛ گشت
(٢) گەل؛ میللەت؛ هەموو گەل (٣) سۆشیالیزم

**collectivize** (kə-lek′tiv-īz′), *v.t.* (١) دانانی سۆشیالیزم لە شوێنێکدا؛ کردن بە سۆشیالیست (٢) گۆڕینی خاوەنێتی و بەرێوەبردنی هۆی بەرهەم لە هی کەسی سەربەستەوە بۆ هی هەموو گەل.

**collector** (kə-lek′tēr), *n.* (١) باجگر؛ باج یا قەرز سەن
(٢) کۆکەرەوە.

**college** (kol′ij), *n.* (١) دانشگا؛ کۆلیج؛ زانستگا
(٢) خانووەکانی دانشگا.
(٣) کۆڕ؛ کۆمەڵەیەک کە ئەندامانی دەسەڵات و ماف و ئەرکێکی تایبەتییان هەبێت و کارێکی تایبەتییان پێ سپێردرابێت: *(the electoral ~)*.
(٤) قوتابخانەی پیشەیی: *(business ~)*.

**College of Cardinals,** کۆلیجی کاردینالان: کۆڕی سەرەک قەشەکانی کڵێسەی کاسۆلیکی رۆما کە پاپا هەڵدەبژێرن و ئەنجوومەنی راوێژکاریی پاپان

**collegial** (kə-lē′ji-əl), *adj.* دانشگایی؛ کۆلیجی.

**collegian** (kə-lē′jən, kə-lē′ji-ən), *n.* قوتابی دانشگا؛ دەرچوویەکی تازەی دانشگا

**collegiate** (kə-lē′jit, kə-lē′ji-it), *adj.* (١) دانشگایی؛ کۆلیجی.
(٢) وەک قوتابیانی دانشگا؛ تایبەتی بە قوتابیانی دانشگا (جۆری ژیان و هەڵسان و دانیشتن): *(a ~ activity)*.

**collenchyma** (kə-leŋ′kə-mə), *n.* تێشووی رووەک کە بریتییە لە شانەی درێژکۆلەی لاکێشەیی کە دیواری سووچەکانی ئەستوورە

**collet** (kol′it), *n.* (١) ئەڵقەیەکی کانزایی
(٢) ئەو بەشەی ئەڵقەیەک کە بەردی ئەڵماسی تێدا دادەرێژرێت.

**collide** (kə-līd′), *v.i.* (١) بەیەکدادان (دوو ئۆتۆمبیل، فرۆکە، شەمەندەفەر... هتد) (٢) بەیەکداهاتن (مرۆڤ، بیروڕا).

**collie** (kol′i), *n.* سەگێکی مام ناوەندی تووک درێژی سەر باریک و درێژە.

**collier** (kol′yēr), *n.* (١) کرێکاری کانە خەڵووز.
(٢) پاپۆڕی گواستنەوەی خەڵووز (٣) کەشتیوانی سەر پاپۆڕێکی وەها

**colliery** (kol′yēr-i), *n.* کانە خەڵووزێک بە خۆی و خانووەکانی و کەرەسەکانییەوە.

**colligate** (kol′ə-gāt′), *v.t.* (١) لێکدان؛ پێکەوەبەستن؛ پێکەوە کۆکردنەوە. (٢) پەیوەندی لەنێواندا پەیداکردن و لێکدانی راستی و بیروڕای جیاواز بۆ گەیشتن بە سوودی گشتی.

-colligation *(n.)*.

**collimate** (kol′ə-māt′), *v.t.* (١) رێک کردن؛ هاورێک کردن.
(٢) خستنەسەر نیشان (تێلسکۆب)؛ جووت کردنی چاو لەگەڵ نیشاندا (تێلسکۆب).

-collimation *(n.)*.

**collimator** (kol′ə-mā′tēr), *n.* جووتکەری چاو لەگەڵ نیشاندا (تێلسکۆب).

**collinear** (kə-lin′i-ēr), *adj.* (١) لەسەر هەمان هێڵن
(٢) هەمان تەوەرەیان هەیە؛ لەسەر هەمان تەوەرەن.

**collins** (kol′inz), *n.* کۆلینز: خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری ساردە لە قۆدکا، جن، ڕەمو ئاوی لیمۆو ئاوی گازاویو شەکر پێکدێت.

**collinsia** (kə-lin′si-ə, kə-lin′zi-ə), *n.* جۆرە ڕووەکێکی گوڵ ڕەنگاوڕەنگە

**collision** (kə-lizh′ən), *n.* (١) بەیەکدادان (دوو ئوتومبیل، پاسکیل، فڕۆکە، شەمەندەفەر... هتد). (٢) بەیەکداهاتن (مرۆڤ، بیروڕا، قازانج)؛ ئاکۆکی.

**collocate** (kol′ō-kāt′), *v.t.* ڕێکوپێک کردن؛ ڕێکخستن؛ ڕیزکردن

**collocation** (kol′ō-kā′shən), *n.* (١) ڕێکوپێک کردن؛ ڕێکخستن؛ ڕیزکردن. (٢) ڕێکخستن یا ڕیزکردنی وشە بەرامبەر یەکتر.

**collodion** (kə-lō′di-ən), *n.* کۆلۆدیون: شلەیەکی زوو گرگری بێ ڕەنگی لینجە زوو وشك دەبێتەوە لە پزیشکەوانیو وێنەگرتندا بەکاردەهێنرێ.

**collogue** (kə-lōg′), *v.i.* [British Dial.], پیلان گێڕان؛ بە نهێنی لەگەڵ دووان

**colloid** (kol′oid), *n.* (١) ماددەیەکی لینجە. (٢) ماددەیەکە لووی " سایرۆید " دەردەدات. (٣) ماددەیەکی ڕوونە لە تێشووی لەشدا دەردەکەوێت لەکاتی ناتاسایدا.

**collop** (kol′əp), *n.* (١) پل؛ پلە گۆشت. (٢) چرچە گۆشتی لەش.

**colloq.**, = colloquial.

**colloquial** (kə-lō′kwi-əl), *adj.* زمانی ووتوویژ: تایبەتی بە زمانی گفتوگۆ یا قسەکردن؛ زمانی دەمەتەقێ؛ زمانی دووان.

**colloquialism** (kə-lō′kwi-əl-iz′m), *n.* (١) زمانی ووتوویژ. گفتوگۆ یا قسەکردن. (٢) زاراوە یا ووتەیەکی گفتوگۆیی، ووتوویژی، یا دەمەتەقێیی

**colloquist** (kol′ə-kwist), *n.* بەشداری کۆڕ یا کۆنفرانسێك.

**colloquium** (kol′ə-kwi′əm), *n.* کۆڕ؛ کۆنفرانس؛ کۆبوونەوەیەکی ئەکادیمی بۆ لێکۆڵینەوە لە باسێکی تایبەتی.

**colloquy** (kol′ə-kwi), *n.* (١) کۆڕ؛ کۆنفرانس. (٢) نووسراوێکی ویژەیی بە زمانی دەمەتەقێ یا ووتوویژ

**collude** (kə-lōōd′, kə-lūd′), *v.i.* پیلانی بەدکاری دانان؛ پیلان گێڕان

**collusion** (kə-lōō′zhən, kə-lū′zhən), *n.* پیلان؛ دەست تێکەڵ کردن بۆ مەبەستێکی خراپ؛ ڕێکەوتن بۆ بەدکاری.

**collusive** (kə-lōō′siv, kə-lū′siv), *adj.* تایبەتی بە پیلان گێڕان؛ ڕێکەوتن بۆ بەدکاری

**collyrium** (kə-lir′i-əm), *n.* دەرمانی چاو؛ دەرمانی چاوشتن

**collywobbles** (kol′i-wob′lz), *n.pl.* [Colloq.], سك ئێشە

**colocynth** (kol′ə-sinth′), *n.* کوژاڵك

**cologne** (kə-lōn′), *n.* کۆلۆنیا؛ ئاوی کۆلۆنیا. بۆنێکی خۆشە مرۆڤ لە خۆی دەدات

**colon** (kō′lən), *n.* جووت خاڵ (:) خاڵبەندی؛ دوو خاڵ.

**colon** (kō′lən), *n.* ڕیخۆڵە گەورە؛ قۆلۆن.

**colon** (kō-lōn′), *n.* دراوی وولاتی " کۆستاریکا " و " سلڤادۆر ".

**colonel** (kũr′n′l), *n.* کۆلۆنێل: پلەیەکی ئەفسەریی بەرزی سوپایە؛ کەرەنێل

-colonelcy *(n.)*; colonelship *(n.)*.

**colonial** (kə-lō′ni-əl), *adj.* (١) کۆلۆنیالی؛ داگیرکەری؛ داگیرکەر. (٢) تایبەتی بەو سیانزە ناوچەیەی داگیرکراوی ئینگلتەرە بوو کە پاش شۆڕشی ئەمەریکا وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای لێ پێکهێنرا.
*n.* دانیشتوویەکی ناوچە یا وولاتێکی داگیرکراو.

**colonialism** (kə-lō′ni-əl-iz′m), *n.* کۆلۆنیالیزم؛ داگیرکەری؛ ئیمپریالیزم؛ ئاواکاری.

**colonic** (kə-lon′ik), *adj.* تایبەتی بە ڕیخۆڵە گەورە؛ قۆلۆنی.

**colonist** (kol′ə-nist), *n.* (١) داگیرکەر؛ دانیشتوویەکی سەرەتایی کۆچ نشینێك؛ کەسێکە کە وولاتی خۆی بەجێ دەهێڵێتو شوێنێکی تر داگیردەکاتو ئاوەدانی دەکاتەوەو دەیکات بە شوێنی نیشتەجێی خۆی. (٢) دانیشتووی کۆچ نشینێك.

**colonization** (kol′ə-ni-zā′shən, kol′ə-nī-zā′shən), *n.* داگیرکردنو ئاوەدانکردنەوە؛ کردن بە ژێردەستەی خۆ؛ داگیرکردن.

**colonize** (kol′ə-nīz′), *v.t.* (١) داگیرکردنو ئاوەدانکردنەوە؛ داگیرکردن؛ کردن بە کۆچ نشین؛ ئاواکردنەوە. (٢) خەڵك نیشتەجێ کردن لە کۆچ نشینێکدا.
*v.i.* (١) کردن بە کۆچ نشین؛ داگیرکردنو ئاوەدانکردنەوە. (٢) نیشتەجێ بوون لە کۆچ نشینێکدا.

**colonnade** (kol′ə-nād′), *n.* ڕیزە پایەی خانوویەك.
-colonnaded *(adj.)*.

**colony** (kol′ə-ni), *n.* (١) کۆچ نشین؛ ژێردەستە؛ شوێنێك کە بێگانە هاتبن داگیریان کردبێتو ئاوەدانیان کردبێتەوە. (٢) نیشتەجێکانی کۆچ-نشینێکی وەها. (٣) وولاتی داگیرکراو؛ ناوچەیەك یا وولاتێکی بێ هێزی داگیرکراو لەلایەن وولاتێکی بەهێزەوە. (٤) [C-]. ئەو سیانزە ناوچەیەی ئەمەریکای باکوور کە لەژێر دەستی ئینگلتەرەدا بوونو پاش شۆڕشی ئەمەریکا ڕزگاریان بوو وە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایان پێکهێنا. (٥) کۆمەڵێك خەڵکی هاوڕەگەز یا هاوپیشە کە لە گەڕەکێکی شاردا نزیك لەیەکەوە بژین. *( the Italian ~ in chicago ; an artist's ~ )* (٦) گەڕەکێکی وەها. (٧) کۆمەڵێك ڕووەك یا گیانداری هاوجۆر کە پێکەوە لەیەك شوێندا بژین.

**colophon** (kol′ə-fon′, kol′ə-fən), *n.* (١) چەند وشەیەك لە کۆتایی پەڕتووکێکدا ناوی نووسەرو کاتو شوێنی بڵاوکردنەوەی پەرتووکەکەی تێدا دەبڕێت. (٢) درووشمی بڵاوکەرەوەی پەڕتووکێك کە لە پەڕەی یەکەمین یا دواهەمینی پەڕتووکەکە دەدرێت.

**color** (kul′ẽr), *n.* (١) ڕەنگ.
(٢) ڕەنگ (جگە لە ڕەشو سپیو بۆر):
*( She likes ~s better than black or white.)*
(٣) ڕەنگی دەموچاو (بەتایبەتی هی سوورو سپی)
(٤) ڕەنگی پێست (مرۆڤ).
(٥) ڕەنگی پێستی قولەڕەشێك یا کەسێکی تری وەها.
(٦) *(pl.)*، نیشانە یا جلی ڕەنگاوڕەنگ کە پێناسەی کەسێکە.
(٧) *(pl.)*، ئاڵا یا درووشمی وولاتێك یا ڕێکخراوێك.
(٨) *(pl.)*، ئەو لایەی کە کەسێك لەسەرێتی؛ هەڵوێستو بیروڕای کەسێك.
*( Stick to your ~s.)*
(٩) ڕووالەت.
(١٠) بەڵگە؛ جێی بڕوابوون:
*( The circumstances gave ~ to his claim.)*
(١١) جۆر؛ چەشن.
(١٢) ڕوون وەك وێنە: *( There is ~ in his writing.)*
(١٣) شێوەی ڕەنگ یا بۆیە بەکارهێنان.
*v.t.* (١) ڕەنگ کردن؛ بۆیەکردن؛ لە خوم دان. (٢) ڕەنگ گۆڕین.
(٣) واڵێکردن کە جێی بڕواپێکردن بێت.
(٤) گۆڕین؛ کارتێکردن *( His experience ~ed his views.)*
*v.i.* (١) ڕەنگ گرتن. (٢) ڕەنگ گۆڕین.
(٣) ڕەنگ سوور هەڵگەڕان؛ تەریق بوونەوە.

call to the colors, (١) گرتن بە سەرباز.
(٢) بانگ کردنی سەربازان بە کەرەنا بۆ هەڵکردنو داگرتنی ئاڵا.

change color, (١) ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان؛ ڕەنگ گۆڕین.
(٢) تەریق بوونەوەو سووربوونەوە.

lose color, ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان؛ ڕەنگ گۆڕین؛ ڕەنگ سپی هەڵگەڕان.

serve with the colors, لە سوپادا بوون.

show one's colors, (١) ڕاستی خۆ پیشاندان؛ ڕووی خۆ هەڵماڵین؛ خۆ ئاشکراکردن. (٢) بیروڕای خۆ دەربڕین؛ هەڵوێستی خۆ ئاشکراکردن.

under color of, بە بیانووی ئەوەوە.

with flying colors, زۆر بە سەرکەوتوویی؛ زۆر بە باشی.

**colorable** (kul′ēr-ə-b′l), *adj.* (١) ڕەنگ دەكرێت؛ ڕەنگ دەگرێت.
(٢) درۆزنە؛ ڕووكەش؛ هەڵخەڵەتێنەر.

**coloration** (kul′ēr-ā′shən), *n.* (١) ڕەنگ
*( Some animals have protective ~ .)*
(٢) ڕێكخستنی ڕەنگ.

**color-bearer** (kul′ēr-bâr′ēr), *n.* هەڵگری ئاڵا.

**color-blind** (kul′ēr-blīnd′), *adj.* ڕەنگ كوێر: ناتوانێت ڕەنگەكان ببینێ یا لەیەكتریان جیابكاتەوە

**color blindness,** ڕەنگ كوێری؛ ڕەنگ نەبینین یا جیانەكردنەوە لەیەكتر

**colored** (kul′ērd), *adj.* (١) ڕەنگدار؛ ڕەنگین
(٢) هی ڕەنگێكی تایبەتی
(٣) هی ڕەگەزێك كە سپی نەبێ بەتایبەتی قولەڕەش؛ ڕەش (ڕەگەز، مرۆڤ).
(٤) گۆڕراو؛ تێكدراو؛ شێواو؛ كارتێكراو:
*( His remarks were ~ by his prejudice.)*

**color filter,** ڕەنگ پاڵێوەر (وێنەكاری).

**colorful** (kul′ēr-fəl), *adj.* (١) ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕەنگین؛ جوانو دڵگیر
(٢) ئەنتیكە

**color guard,** هەڵگرو پاسەوانی ئاڵا

**colorific** (kul′ēr-if′ik), *adj.* (١) ڕەنگدەرەوە؛ ڕەنگدار.
(٢) وەك ڕەنگ؛ ڕەنگ.

**colorimeter** (kul′ēr-im′ə-tēr), *n.* ئامێری دیاریكردن یا دەست- نیشان كردنی ڕەنگو پێوانی تۆخی ڕەنگ

-**colorimetric** *(adj.)*; colorimetrically *(adv.)*.

**colorimetry** (kul′ēr-im′ə-tri), *n.* دیاریكردنی ڕەنگو پێوانی تۆخی ڕەنگ.

**coloring** (kul′ēr-iŋ), *n.* (١) ڕەنگ لێدان؛ ڕەنگ كردن
(٢) ڕەنگ: نۆیە؛ خوم. (٣) ڕوواڵەت؛ ڕووكەش. (٤) ڕەنگ.
(٥) شێواز یا ڕەنگێكی تایبەخۆ

**colorist** (kul′ēr-ist), *n.* (١) ڕەنگ بەكارهێنەر.
(٢) وێنەكێشێكی لێهاتوو لە بەكارهێنانی ڕەنگدا

**colorless** (kul′ēr-lis), *adj.* (١) بێ ڕەنگ.
(٢) ڕەنگ مردوو؛ ڕەنگ هەڵگەڕاو (٣) ووشكو بێ تام (مرۆڤ، كردار، ڕووداو).
(٤) بێ لایەن.

**color line,** *Also* color bar, دیواری كۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕامیاری كە ڕەگەزی سپیو ڕەگەزەكانی تر بەتایبەتی ڕەش لەیەكتری جیادەكاتەوە.

**colossal** (kə-los′′l), *adj.* زۆر زل؛ زل؛ زۆر گەورە

**colosseum** (kol′ə-sē′əm), *n.* (١) coliseum .
(٢) [C-]. یاریگای گەورەی بەناوبانگی ڕۆمای كۆن

**colossus** (kə-los′əs), *n.* (١) پەیكەرێكی زۆر زل.
(٢) كەسێك یا شتێكی زۆر زل یا گرنگ

**colostomy** (kə-los′tə-mi), *n.* دروستكردنی كونەقنگێكی دەستكرد لە ڕیخۆڵە گەورەدا بە نەشتەرگەری.

**colostrum** (kə-los′trəm), *n.* فرۆ: شیری پاش زاین یا منداڵبوون بۆ چەند ڕۆژێك كە زۆر خەستە.

**colour** (kul′ēr), *n. & v.* = **color.**, [British Spelling].

**-colous** (kə-ləs), پاشكۆیەكە بەمانای: لەگەڵ یا لەناودا گەورەبوونو ژیان: *( arenicolous)* .

**colpitis** (kol-pī′tis), *n.* هەوكردن یا داگیرسانی زێ.

**colporteur** (kol′pôr′tēr), *n.* كەسێك یا فرۆشیارێكی گەڕۆك كە ئینجیلو نامیلكەی ئاینی دەدات بە خەڵك.

**colt** (kōlt), *n.* (١) جوانوو (بەتایبەتی هی ئەسپ).
(٢) كەسێكی هەرزە یا نەشارەزا؛ كەسێكی تازەكوورە.
(٣) گورز؛ پەتێكی سەر گرێدراو بۆ فەلاقەكردن.

**colter** (kōl′tēr), *n. Also* spelled "coulter" , گاسن

**coltish** (kōl′tish), *adj.* وەك جوانووی ئەسپ؛ سرك.

**coltsfoot** (kōlts′foot′), *n.* ڕووەكێكی گوڵ زەردو بچووكە دەرمانی لێ دەردەهێنرێ.

**colubrine** (kol′yoo-brīn′, kol′yoo-brin), *adj.* (١) وەك مار؛ ماری. (٢) تایبەتی بە ماری ناژەهراوی

**columbarium** (kol′əm-bâr′i-əm), *n.* (١) ژوورێچكەیەكە كراوە بە خانە خانە بۆ تیادانانی ئەو شووشە یا كووپانەی خۆڵەمێشی لاشەی سووتێنراوی تێدا دەپارێزرێ. (٢) یەكێك لەم خانانە. (٣) كولانەی كۆتر.

**columbary** (kol′əm-ber′i), *n.* كولانەی كۆتر.

**columbine** (kol′əm-bīn′), *n.* ڕووەكێكی گوڵ ڕەنگاوڕەنگە گوڵەكەی لە كۆمەڵە كۆتر دەچێت.
*adj.* كۆترانە؛ تایبەتی بە كۆتر.

**columbite** (kə-lum′bīt), *n.* كانزایەكی ئاوێتەی ڕەشە

**column** (kol′əm), *n.* (١) پایە؛ كۆڵەكە؛ ستوون.
(٢) شتێك كە لە كۆڵەكە بچێت: *( the spinal ~ )*
(٣) ڕیز؛ شەقڵ. (٤) ووتارێكی تایبەتی ناو گۆڤار یا ڕۆژنامەیەك.
(٥) قۆڵ (سوپا)؛ تابوور؛ ڕیزە سەرباز یا پاپۆڕی شەڕ.

**columnar** (kə-lum′nēr), *adj.* (١) ستوونی؛ وەك ستوون یا كۆڵەكە
(٢) لە ستوون یا كۆڵەكە پێكهاتوو. (٣) شەقڵ شەقڵ (نووسین یا چاپكردن).

-**columned** *(adj.)*.

**columniation** (kə-lum′ni-ā′shən), *n.* بەكارهێنانو ڕێكخستنی كۆڵەكە لە خانوویەكدا.

**columnist** (kol′əm-nist, kol′əm-ist), *n.* نووسەری ووتاری تایبەتی ڕۆژانە یا ناوبەناو لە ڕۆژنامە یا گۆڤارێكدا.

**colza** (kol′zə), *n.* (١) جۆرە ڕووەكێكە وەك لەهانە؛ تۆوی ئەم ڕووەكە.
(٢) ڕۆنی ئەم ڕووەكە كە لە چرادا دەسووتێنرێ

**com-** (kom, kəm), پێشكۆیەكە بەمانای: پێكەوە؛ لەگەڵ:
**( commingle, combine, compact )**
(ئەم پێشكۆیە لەبەردەم هەندێ تیپدا دەبێ بە: -col ، -cor ، -con ، یا -co بە هەمان مانا).

**coma** (kō′mə), *n.* لە هۆش خۆ چوون یا بوورانەوەیەكی دوورودرێژ (لە ئەنجامی نەخۆشی یا برینداربووندا).

**coma** (kō′mə), *n.* (١) تۆپەڵێكی وەك هەور لە ناوەڕاستی ئەستێرەیەكی كلكداردا. (٢) تۆپەڵێك گەڵا كە بەسەری هەندێ میوەوەن (وەك ئەناناس)؛ ڕیشۆڵەی سەری هەندێ تۆو. (٣) لێڵی یا ناڕوونی (وێنەگری).

**comate** (kō′māt), *adj.* (١) دەوردراوە بە تۆپەڵێكی وەك هەور.
(٢) ڕیشۆڵەدار (تۆو)؛ تووكن.

**comate** (kō-māt′, kō′māt′), *n.* دۆست؛ هاوجێ یا هاوسەرین.

**comatose** (kom′ə-tōs′, kō′mə-tōs′), *adj.* (١) لە هۆش خۆ چوو بۆ ماوەیەكی زۆر (لە ئەنجامی نەخۆشی یا برینداربووندا).
(٢) تەمەڵ؛ سست.

**comb** (kōm), *n.* (١) شانە (قژداهێنان). (٢) ڕنەك (ووڵاخ).
(٣) پۆپنە (كەڵەشێر). (٤) لووتكە یا پۆپی هەندێ شت وەك شەپۆل یا شەپقە.
(٥) شانە (هەنگوین).
*v.t.* (١) شانەكردن؛ داهێنان (قژ)؛ سەرداهێنان.
(٢) بەووردی گەڕان (بە دوای شتێكدا)؛ شانەكردن:
*( We've ~ed the house for that book.)*
*v.i.* شكانەوە (شەپۆل).

**comb** (kōōm, kōm), *n.* = **coomb.**

**combat** (kom′bat, kum′bat), *v.i.* شەڕكردن؛ بەرهەڵستی كردن؛ دژ وەستان.
*v.t.* شەڕ لەگەڵ كردن؛ بەرهەڵستی كردن؛ دژ وەستان.
*n.* (١) شەڕ؛ جەنگ. (٢) خەبات
*adj.* جەنگی؛ تایبەتی بە جەنگ یا شەڕ.

**combatant** (kom′bə-tənt, kum′bə-tənt), *n.* (١) جەنگاوەر؛

شەڕکەر (٢) کەسێك کە لە هێزی چەکداری میریدا بێت‌و بەشداری جەنگ بکات.

***adj.*** جەنگاوەر؛ شەڕکەر؛ لە شەڕدایە.

**combat fatigue,** ماندووی جەنگ.

**combative** (kəm-bat′iv, kom′bə-tiv, kum′bə-tiv), *adj.* شەڕانی؛ جەنگاوەر؛ شەڕەنگێز.

**combe** (kōōm, kōm), ***n.*** = coomb.

**comber** (kōm′ēr), ***n.*** (١) کەسێك یا مەکینەیەك کە خوری یا لۆکە جیادەکاتەوە یا دایدەهێنێت (٢) شەپۆلێکی گەورە کە دەشکێتەوە بەسەر کەناری دەریادا.

**combination** (kom′bə-nā′shən), ***n.*** (١) تێکەڵاو؛ تێکەڵ.
(٢) شتێکی تێکەڵاو (وەك ژەمێك خواردەمەنی کە لە چەند خواردەمەنی‌یەك پێکهاتبێ) (٣) یەکێتی؛ کۆمەڵە.
(٤) ئەو ئمرانە یا تیپانەی قفڵی ئمرەی پێ دەکرێتەوە.
(٥) چۆنێتی کارپێکردنی ئەم جۆرە قفڵە.
(٦) پارچەیەك جلی ژێرەوە کە بریتی‌یە لە فانیلەو دەرپێ پێکەوە.
(٧) تێکەڵاوکردنی چەند ماددەیەکی کیمیایی بۆ پێکهێنانی ئاوێتەیەك.
(٨) لێکدانی ئمرە یا تیپ بۆ پێکهێنانی ئمرە یا کۆمەڵە تیپی تازە. (بۆ نموونە: لێکدانی جووتەی ١،٢،٣،٤ ئەمانەن: ١٢،١٣،١٤،٢٣،٢٤،٣٤).

**-combination** *(adj.).*

**combination lock,** قفڵێکە لەباتی کلیل بە جووت کردنی چەند ئمرە یا تیپێك لەگەڵ یەکتردا دەکرێتەوە؛ قفڵی ئمرەدار.

**combine** (kəm-bīn′), ***v.t. & v.i.*** (١) لێکدان؛ پێکەوەبەستن؛ کۆکردنەوە؛ کۆبوونەوە؛ یەکخستن؛ کردن بە یەك؛ تێکەڵاوکردن.
(٢) تێکەڵاوکردن‌و پێکهێنانی ئاوێتەیەك (کیمیا).

***n.*** (١) کۆمباین مەکینەی درەوکردن.
(٢) یەکێتی ڕێکخراوێك بۆ مەبەستی بازرگانی یا ڕامیاری.

**combings** (kōm′iŋz), ***n.pl.*** ئەو قژەی شانە لە سەری دەکاتەوە؛ ئەو تووکەی ڕنەك لە وڵاخی دەکاتەوە.

**combining form,** (١) پێشگۆ (وەك: " tele- " لە ووشەی " telephone " دا، " auto- " لە ووشەی " automobile " دا).
(٢) پاشگۆ (وەك " -logy " لە ووشەی " biology " دا، " -ness " لە ووشەی " darkness " دا).

**combust** (kəm-bust′), ***adj.*** ئەوەندە نزیکە لە خۆرەوە کە دادەپۆشرێت یا دەسووتێت بە ڕووناکی خۆر (ئەستێرە).

**combustible** (kəm-bus′tə-b'l), ***adj.*** (١) بەئاسانی دەسووتێت؛ خێرا گڕدەگرێت. (٢) زوو دێتەجۆش؛ خێرا دێتەجۆش یا گڕدەگرێت.

***n.*** ماددەیەك کە زۆر بەخێرایی گڕدەگرێت یا دەسووتێت.

**-combustibility** *(n.).*

**combustion** (kəm-bus′shən), ***n.*** (١) سووتان؛ گڕگرتن.
(٢) ئاگرتێچوون (جەماوەر، مرۆڤ)؛ هاتنەجۆش؛ توورەبوون‌و ئاگرلێبوونەوە.

**come** (kum), *v.i.* (١) هاتن (٢) وەرە؛ بێ *( ~ here ! )*.
(٣) گەیشتن *( The bus line ~s near the hotel.)*.
(٤) ڕوودان *( Success came to him early in life.)*.
(٥) هاتن *( After 9 ~s 10 .)*.
(٦) هاتنەدی *( Peace will ~ in time.)*.
(٧) لێوەهاتن *( He ~s from an old family.)*.
(٨) لێوەپەیدابوون *( Illness may ~ from a poor diet.)*.
(٩) والێهاتن *( My shoes came loose.)*.
(١٠) بوون؛ دەسکەوتن *( This dress ~s in four sizes.)*.
(١١) کردنە ئەوەندە *( The bill ~s to seven dollars.)*.
(١٢) ئاوهاتنەوە.

***interj.*** دەبڕۆ!؛ بەسیەتی!؛ دە هەستە!؛ دە وازبێنە!

**come about,** (١) ڕوودان؛ هاتنەدی.
(٢) گەڕانەوە؛ پێچکردنەوە (٣) ڕێباز گۆڕین

**come across,** (١) پێ گەیشتن یا تووش بوون بە ڕێکەوت (مرۆڤ)؛ دۆزینەوە بە ڕێکەوت (شت)؛ هاتنەبەرچاو یا بەرگوێ.
(٢) [Slang]، کردن یا ووتن یا پێدانی ئەو خواستە یا داوایەی کە کراوە.

**come and get it! [Colloq.],** خواردن ئامادەیە (دایکێك دەیڵێت بە خێزانەکەی).

**come around (or round),** (١) هاتنەوە هۆش خۆ؛ هۆش هاتنەوە.
(٢) ڕێباز گۆڕین؛ هەڵوێست یا بیروباوەڕ گۆڕین.
(٣) [Colloq.]، قایل بوون؛ پەسەندکردن؛ بادانەوە (مەجاز).
(٤) [Colloq.]، سەرلێدان؛ سەردان کردن؛ هاتن بۆ لا.

**come at,** (١) دەسکەوتن؛ پێ گەیشتن (ئامانج).
(٢) هەڵمەت بۆ هێنان؛ هێرش بۆ هێنان.

**come back,** (١) گەڕانەوە؛ هاتنەوە.
(٢) [Slang]، قسە پێ ووتنەوە؛ بەتوندی وەڵامدانەوە.
(٣) بادانەوە؛ گەڕانەوە دۆخی جاران.

**come between,** بوون بەهۆی زویربوون‌و ناخۆشی؛ ناخۆشی خستنە نێوان دوو کەس یا کۆمەڵەوە (مرۆڤ، شت)؛ هاتنە نێوانەوە؛ لەیەك دابڕین.

**come by,** دەسکەوتن؛ دەستگیربوون؛ چنگ کەوتن.

**come down,** (١) شکان (پلەی کۆمەڵایەتی کەسێك یا سامانەکەی)؛ هاتنەخوارەوە (نرخ)؛ شکان (نرخ)؛ داشکان. (٢) بۆ مانەوە لە باوو باپیرەوە؛ بۆ هاتنەخوارەوە لە باوو باپیرەوە.

**come down on (or upon),** (١) پەلاماردان؛ هێرش بردنە سەر.
(٢) هێرش بردنە سەر بە دەم یا بە قسە؛ سەرزەنشت کردن؛ شکاندن (مرۆڤ).

**come down with,** تووش بوون (نەخۆشی).

**come forward,** هاتنە پێشەوە؛ خۆبەختکردن؛ لەخۆبوردن.

**come in,** (١) هاتنەژوورەوە.
(٢) گەیشتن (مرۆڤ بۆ شوێنێك، فڕۆکە، شەمەندەفەر... هتد).
(٣) بوون بە مۆدە.

**come in for. [Colloq.],** دەسکەوتن؛ دەستگیربوون؛ چنگ کەوتن.

**come into,** (١) چوونە ناو؛ چوونە پاڵ.
(٢) (ا) دەسکەوتن؛ دەستگیربوون. (ب) بۆ مانەوە (میرات).

**come into sight,** دەرکەوتن؛ هاتنەبەرچاو.

**come off,** (١) لەیەکبوونەوە؛ لەیەك ترازان؛ لەیەك جیابوونەوە (دوو شت)؛ هەڵوەشان. (٢) ڕوودان؛ قەومان. (٣) [Colloq.]، بوون بە ئەنجام

**come of age,** گەیشتنە تەمەنی هەژدە ساڵ؛ باڵق بوون؛ گەورەبوون.

**come on,** (١) باشتربوون؛ چاکتربوون؛ بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن.
(٢) تووش بوون بە ڕێکەوت؛ دۆزینەوە بە ڕێکەوت؛ هاتنەبەرچاو؛ هاتن بەسەردا
(٣) هێرش بردنە سەر. (٤) هاتنە سەر شانۆ؛ دەرکەوتن لەسەر شانۆ

**come on! [Colloq.],** (١) با بڕۆین!.
(٢) دە بڕۆ؛ دە هەستە!؛ توخوا!؛ تکایە!؛ بەسیەتی!.

**come out,** (١) ئاشکرابوون؛ هاتنەڕوو؛ دەرکەوتن.
(٢) هاتنەدەرەوە بۆناو کۆمەڵ. (٣) ئەنجام وابوون؛ بوون بە:
*( He came out third in the race.)*

**come out with,** (١) ئاشکراکردن؛ دەرخستن؛ خستنەڕوو.
(٢) بڵاوکردنەوە؛ ووتن. (٣) خستنەناو بازاڕەوە.

**come over,** لێ ڕوودان؛ تووش بوون:
*( These feelings often come over me.)*

**come through,** (١) ڕزگاربوون لە نەخۆشی یا تەنگوچەڵەمە.
(٢) [Slang]، کردن یا پێدانی خواستێك؛ دڵ نەشکاندن.

**come to,** (١) هاتنەوە هۆش خۆ پاش بەنجی نەشتەرگەری یا بوورانەوە
(٢) بریتی بوون لە؛ وەك ئەوە وابوون.
(٣) لەنگەرخستن (پاپۆڕ).

**come to an agreement,** ڕێکەوتن.

**come to an end,** کۆتایی هاتن.

**come to pass,** ڕوودان.

**come under,** بەشێك بوون لە (بابەت، دەسەڵات)؛ لەژێر سەرباسێکدا بوون.

**come up,** باسکرانی شتێك لە ووتووێژ یا ئاخاوتنێکدا؛

*( The subject did not come up in our discussion.)*

**come upon,** (١) تووش بوون به ڕێکەوت؛ پێ گەیشتن بە ڕێکەوت؛ لەپڕ هاتن بەسەردا. (٢) هێرش بردنە سەر.

**come up against,** تووش بوون (تەنگوچەڵەمە، کۆسپ، گرانی)

**come up to,** (١) گەیشتنە پلەیەکی تایبەتی یا ویستراو. (٢) ئەوەندە بوون.

**come up with,** پێشنیازکردن؛ پێشکەش کردن؛ هێنان؛ پەیداکردن؛ دۆزینەوە (ڕێگە، نەخشە، ڕێباز بۆ کردنی شتێك)

**how come?** [Colloq.], بۆچی؟؛ چۆن؟؛ چۆنە وا؟؛ لەبەرچی؟

**comeback** (kum′bak′), *n.* (١) [Colloq.]، وەرگرتنەوەی پلەی جاران؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران (بۆ پلە بەرزی، سەرکەوتن، یا ساماندارى)؛ بادانەوە (٢) [Slang]، وەڵامێکی بلیمەتانە؛ قسە پێ ووتنەوە.

**comedian** (kə-mē′di-ən), *n.* (١) قۆشمە؛ قۆشمەچی؛ قۆشمەباز (٢) ئەکتەری شانۆگەری قۆشمە یا کۆمیدیا. (٣) نووسەری شانۆگەری قۆشمە؛ نووسەری کۆمیدیا.

**comedienne** (kə-mē′di-en′), *n.* (١) ئەکتەری ژنی شانۆگەری قۆشمە یا کۆمیدیا (٢) ژنێکی قۆشمەچی یا قۆشمەباز

**comedo** (kom′i-dō′), *n.* زیپکەیەکی سەر ڕەشە کێمی تێدایە لە پێست دێت بەتایبەتی لە دەموچاو

**comedown** (kum′doun′), *n.* پلەی کۆمەڵایەتی یا دارایی شکان؛ ڕووخان (پلەی کۆمەڵایەتی و ڕێزو سامان... هتد).

**comedy** (kom′ə-di), *n.* (١) کۆمیدیایەك؛ شانۆگەرییەکی قۆشمە. (٢) فیلمێکی سینەمایی قۆشمە. (٣) هونەرو شێوەی نووسین و نواندنی فیلم و شانۆگەری قۆشمە (٤) شانۆگەری قۆشمە؛ کۆمیدیا. (٥) ڕووداوێکی قۆشمە یا سەیر. (٦) چیرۆکێکی قۆشمە

**comedy of manners,** شانۆگەرییەکە کە خوو و نەریتی چینە سەرمایەدارەکانی کۆمەڵ پیشان دەدات و گاڵتەیان پێ دەکات.

**comely** (kum′li), *adj.* (١) جوان؛ دڵگیر. (٢) بەجێ؛ شیاو؛ درووست؛ ڕێكوپێك.

**-comeliness** *(n.).*

**come-on** (kum′on′), *n.* (١) [Slang]، ساختەچی؛ کەسێکی فێڵباز کە بە ڕووڵەت سەرڕاست دیارە (٢) سەیرکردنێك یا هێمایەك کە بڵێت: " تۆم بەدڵەو ئەمەوێت " (لە ژنێکەوە بۆ پیاوێك یا بەپێچەوانەوە). (٣) هاندەر (شت)؛ شتێك کە دەدرێت بە کەسێك بە خۆڕایی بۆ دڵ ڕاهێنان و هاندانی بۆ کردنی کارێك یا کڕینی شتێك.

**comer** (kum′ẽr), *n.* (١) کەسێکی هاتوو؛ ئەو کەسەی کە دێت. (٢) [Slang]. کەسێك یا شتێك کە هیوای سەرکەوتنی لێ دەکرێت.

**comestible** (kə-mes′tə-b'l), *adj.* دەخورێت؛ بەکاری خواردن دێت

***n.pl.*** ,خواردەمەنی؛ خواردن.

**comet** (kom′it), *n.* ئەستێرەی کلکدار.

**comet finder** (or **seeker**), تێلیسکۆپی بەدوای ئەستێرەی کلکداردا گەڕان

**comeuppance** (kum′up′'ns), *n.* [Slang], سزا؛ سزایەکی ڕەوا.

**comfit** (kum′fit, kom′fit), *n.* نوقوڵ؛ شیرینی؛ میوەی وشك کراوەی شیرین

**comfort** (kum′fẽrt), *v.t.* (١) دڵنەوایی کردن؛ دڵخۆشی دانەوە؛ لاواندنەوە؛ ئاسوودەیی پێدان؛ خەم ڕەواندن. (٢) [Archaic]، یاریدەدان؛ یارمەتیدان

***n.*** (١) یارمەتیدان؛ دالدەدان؛ هاندان: *( to give them aid and ~ )* . (٢) دڵنەوایی؛ لاواندنەوە؛ دڵخۆشی دانەوە. (٣) دڵنەواییکەر (مرۆڤ، شت). (٤) ئاسوودەیی؛ خۆش گوزەرانی و بەختیاری؛ حەسانەوە (٥) ئاسوودەبەخش (شت)؛ خەم ڕەوێن. (٦) لێفە.

**comfortable** (kum′fẽr-tə-b'l), *adj.* (١) ڕەحەت *( a ~ bed ; ~ shoes)* (٢) پڕ ئاسوودەیی: *( He leads a ~ life.)* (٣) لە خۆشیدا؛ لە ئیسراحەتدا: *( I feel ~ here.)* . (٤) [Colloq.]، بەسە؛ کەم نییە؛ نە کەم و نە زۆر: *( a ~ salary)*

***n.*** لێفە.

-comfortably *(adv.).*

**comforter** (kum′fẽr-tẽr), *n.* (١) ئاسوودەبەخش (مرۆڤ، شت). (٢) لێفە. (٣) ملپێچێکی درێژی خوری.

**comforting** (kum′fẽrt-iŋ), *adj.* دڵخۆشکەر؛ ئاسوودەبەخش؛ دڵنەواییکەر؛ هیوابەخش.

**comfortless** (kum′fẽrt-lis), *adj.* بێ ئاسوودە؛ بێ ئیسراحەت؛ کەس تیایدا ناحەوێتەوە.

**comfort station,** ئاودەستخانەی گشتی.

**comfrey** (kum′fri), *n.* جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکەی زبرو بچووکە بۆ دەرمان بەکاردەهێنرێت (گەڵاکەی وەك چا لێدەنرێت و دەخورێتەوە).

**comic** (kom′ik), *adj.* (١) کۆمیدیایی. (٢) قۆشمە؛ سەیر. (٣) کارتۆنی.

***n.*** (١) کەسێکی قۆشمە؛ قۆشمەچی؛ ئەکتەری شانۆگەری کۆمیدیا. (٢) (*pl.*)، [Colloq.]، کارتۆن.

**comical** (kom′i-k'l), *adj.* قۆشمە (مرۆڤ، ڕووداو)؛ سەیر (مرۆڤ، ڕووداو).

**comic book,** پەڕتووکی کارتۆن.

**comic strip,** کارتۆن؛ چەند کارتۆنێك کە چیرۆکێك دەردەبڕن.

**coming** (kum′iŋ), *adj.* (١) ئاییندە؛ داهاتوو: *( the ~ Friday)* . (٢) [Colloq.]، هیوای سەرکەوتنی لێ دەکرێت: *( a ~ young actor)* .

**comitia** (kə-mish′i-ə), *n.* کۆمیتە: ئەنجوومەنێکی هاووڵاتیان لە ڕۆمای کۆندا کە فەرمانبەرانی هەڵدەبژاردو یاسای دادەنا.

**comity** (kom′ə-ti), *n.* ئەزاکەت؛ ناسکی؛ ڕەفتار جوانی.

**comity of nations,** (١) ڕێزبوونی وڵاتێك بۆ یاساو دەزگاکانی وڵاتانی تر. (٢) ئەو وڵاتانەی پەیڕەوی ئەم بنەمایە دەکەن.

**comma** (kom′ə), *n.* (١) وێرگول (خاڵبەندی). (٢) وەستانێکی کورت (ڕستە).

**comma bacillus,** میکرۆبی کۆلێرای ئاسیاوی

**command** (kə-mand′, kə-mänd′), *v.t.* (١) فەرمان کردن؛ فەرمان بەسەردا کردن؛ بەتوندی پێ ووتن؛ بەسەردا خوڕین. (٢) دەسەڵات بەسەردا بوون؛ فەرماندەری کردن. (٣) زانین و توانای بەکارهێنان هەبوون: *( He ~s a large vocabulary.)* (٤) شایستەبوون؛ ڕەوابوون؛ هەق بوون: *( His knowledge ~s respect.)* (٥) بەسەردا ڕوانین: *( The fort ~s the entire valley.)* .

***v.i.*** دەسەڵات بەکارهێنان؛ فەرماندەرێتی کردن.

***n.*** (١) فەرمان؛ فەرمایشت؛ فەرموودە. (٢) دەسەڵاتی فەرماندەرێتی هەبوون. (٣) مەودای بینین. (٤) توانین؛ زانین (زمانێك و بەکارهێنانی). (٥) ناوچە یا بنکەیەکی سوپایی کە لەژێر فەرماندەرێتی کەسێکدا بێت (٦) فەرمانگەی فەرماندەرێکی وەها.

**commandant** (kom′ən-dant′, kom′ən-dänt′), *n.* فەرماندە؛ فەرماندەی ناوچەیەکی سوپایی؛ سەرلەشکری سوپا لە ناوچەیەکدا؛ سەرکردە.

**commandeer** (kom′ən-dêr′), *v.t.* (١) بەزۆر گرتن بە سەرباز. (٢) دەست بەسەرداگرتنی شتومەك (بەتایبەتی زەوی وزارو خانوو) بۆ بەکارهێنانی میری یا سوپا؛ دەست بەسەرداگرتن. (٣) [Colloq.]، بەزۆر دەست بەسەرداگرتن و بردن: *( They ~ed a bus.)* .

**commander** (kə-man′dẽr, kə-män′dẽr), *n.* (١) فەرماندەر؛ سەرۆك؛ سەرکردە. (٢) سەرلەشکری بڕگەیەکی سوپا؛ فەرماندەری سوپای ناوچەیەك. (٣) ئەندامێکی بەرزی هەندێ ڕێکخراوی سوارچاکی یا هی تر. (٤) پلەیەکی مام ناوەندییە لە هێزی دەریایی ئەمەریکادا.

**commander in chief,** (١) فەرماندەری گشتی هێزی چەکداری وڵاتێك؛ سەرلەشکر؛ سوپاسالاری گشتی؛ سەرکردەی گشتی. (٢) سەرکردەی هێزی چەکداری وڵاتێك لە ناوچەیەکی جەنگدا.

**commandery** (kə-man′dẽr′i, kə-män′dẽr′i), *n.*-(١) ناوچە- یەك كە لەژێر دەستی سەركردەیەكی سوارچاكاندا بێت.
(٢) پلەی سەركردەیەكی وەها لە ڕێكخراوی سوارچاكاندا.
(٣) لقی ڕێكخراوێكی وەها.

**commanding** (kə-man′diŋ), *adj.* (١) فەرماندەر
(٢) زاڵ. (٣) سەرنج ڕاكێش؛ بەهێز.
(٤) دەڕوانێت بەسەریدا: ***(a ~ hilltop)***.

**commanding officer,** سەرلەشكری ناوچە

**commandment** (kə-mand′mənt, kə-mänd′mənt), *n.* (١) فەرمان؛ فەرمایشت؛ فەرموودە. (٢) [C-]، یەكێك لە دە فەرمانەكەی ئینجیل.

**command module,** ئەو بەشەی پاپۆڕێكی هەوایی‌یە كە ئاسمان- گەڕەكان تیایدا دەژین و سەركردایەتی پاپۆڕە هەوایی‌یەكەی لێوە دەكەن.

**commando** (kə-man′dō, kə-män′dō), *n.* (١) تاقمە سەربازێك (لە خوارووی ئەفەریقا) (٢) هێرشێك كە ئەم تاقمە سەربازە بیكەن.
(٣) كۆماندۆ پێشمەرگەیەك كە لە ناوچەیەكدا خەبات دەكات كە دوژمن دەستی بەسەرداگرتبێت

**command performance,** خۆنوواندنێكی شانۆگەری كە لەسەر خواستی شا یا سەرەك كۆمار پێشكەش بكرێت.

**command post,** بارەگا یا بنكەی سەركردایەتی لەشكر لە مەیدانی جەنگدا.

**commeasurable** (kə-mezh′ẽr-ə-b′l), *adj.* هاوتا؛ هاوكێش.

**commedia dell'arte,** كۆمیدیایەك یا شانۆگەری‌یەكی قۆشمەیە لە سەدەی شانزەهەم لە ئیتاڵیا دامەزرا كە بریتی بوو لە دەستكاری كردنی سەرپێ‌یی ئەخشەی گشتی شانۆگەری‌یەكەو بەكارهێنانی كەسانی ناو شانۆگەری ناسراو

**comme il faut,** [Fr.]. بەجێ؛ شیاو؛ درووست؛ چۆن پێویستە وەها.

**commemorate** (kə-mem′ẽr-āt′), *v.t.* یادكردنەوە؛ یادكردنەوەی ڕووداو یا بەسەرهاتێك؛ بیرەوەری كردنەوە.

-commemorator *(n.)*.

**commemoration** (kə-mem′ẽr-ā′shən), *n.* یادكردنەوە؛ تازەكردنەوەی یادی ڕووداوێك؛ بیرەوەری كردنەوە.

**in commemoration of,** بە یادی (فلاز شت، كەس، یا ڕووداو)ەوە.

**commemorative** (kə-mem′ẽr-ā′tiv, kə-mem′ẽr-ə-tiv), *adj.* یادكردنەوەیی؛ یادی؛ تایبەتی بە یادكردنەوە.
***n.*** یادكردنەوەیەك؛ چالاكی‌یەك كە بۆ یادكردنەوەی كەسێك یا ڕووداوێك پێشكەش دەكرێت.

**commemoratory** (kə-mem′ẽr-ə-tôr′i, kə-mem′ẽr-ə-tō′ri), *adj.* = **commemorative.**

**commence** (kə-mens′), *v.i. & v.t.* دەستپێكردن

**commencement** (kə-mens′mənt), *n.* (١) دەستپێكردن.
(٢) كاتی دەستپێكردن. (٣) ڕۆژی دەرچوونی قوتابیانی دوا پۆلی زانكۆ یا دانشگا یا قوتابخانەیەك و دابەشكردنی بڕوانامە بەسەریاندا.
(٤) ئەو ئاهەنگەی بەم بۆنەیەوە دەگێڕرێت.

**commend** (kə-mend′), *v.t.* (١) پێ سپاردن. (٢) پەسەندكردن.
(٣) ستایش كردن؛ ئافەرین كردن (٤) [Archaic]، ڕێزو سڵاو ناردن بۆ برادەرێك بە یەكێكدا كە دەچێت بۆ لای؛ ڕێزو سڵاو پێ گەیاندن.

**commendable** (kə-mend′ə-b′l), *adj.* جێی ستایشە؛ جێی ستایش كردنە؛ باش.

**-commendably** *(adj.)*.

**commendation** (kom′ən-dā′shən), *n.* (١) پێ سپاردن
(٢) پەسەندكردن. (٣) ستایش؛ ستایش كردن.
(٤) *(pl.)*، [Archaic]. ڕێزو سڵاو ناردن بۆ برادەرێك بە كەسێكی تردا.

**commendatory** (kə-men′də-tôr′i, kə-men′də-tō′ri), *adj.* ستایشی؛ پەسەندی.

**commensal** (kə-men′səl), *n.* (١) هاوخوان؛ كەسێك كە هەمیشە لەسەر هەمان مێز نانت لەگەڵ دەخوات. (٢) هاونشین؛ ڕووەك یا گیاندارێك كە لەگەڵ ڕووەك یا گیاندارێكی تردا دەژی لە هەمان شوێندا بەبێ ئەوەی مفتەخۆر بێت.
*adj.* هاوخوانە؛ هاونشین.

**commensalism** (kə-men′səl-iz′m), *n.* (١) هاوخوانی.
(٢) هاونشینی.

**commensality** (kom′en-sal′ə-ti), *n.* = **commensalism.**

**commensurable** (kə-men′shoor-ə-b′l, kə-men′sẽr-ə-b′l), *adj.* (١) دەپێورێت یا دەكێشرێت بە هەمان پێوەر یا كێشان.
(٢) وەك یەك؛ هاوتا؛ هاوكێش (٣) بەگوێرەی؛ بەپێی.

-commensurability *(n.)*; **commensurably** *(adv.)*.

**commensurate** (kə-men′shoor-it, kə-men′sẽr-it), *adj.* (١) هاوتا؛ هاوكێش؛ وەك یەك؛ ئەوەندەی یەك. (٢) بەگوێرەی؛ بەپێی
(٣) دەپێورێت یا دەكێشرێت بە هەمان پێوەر یا كێشان.

**commensurate with,** بەگوێرەی؛ بەپێی؛ ئەوەندەی؛ هاوكێش بێت لەگەڵ.

-commensuration *(n.)*.

**comment** (kom′ent), *n.* (١) لێدووان (لە نووسین، كردەوە، ڕەووشت، یا ڕووداوێك). (٢) تێبینی؛ ڕەخنە؛ ڕوونكردنەوە.
(٣) دەمەتەقێ؛ قسە؛ لە پاشەملە قسەكردن؛ ووتووێژ
*v.i.* لێدووان؛ ڕەخنەگرتن؛ تێبینین؛ ووتن؛ ڕوونكردنەوە.
*v.t.* [Archaic], ڕوونكردنەوە (باسی گران لە پەراوێزدا)؛ لێدووان.

**commentary** (kom′ən-ter′i), *n.* (١) لێدووان؛ تێبینی
(٢) ڕوونكردنەوە؛ چەند تێبینی‌یەك بە مەبەستی ڕوونكردنەوە.
(٣) یادداشت؛ یادداشت یا نووسینێكی مێژوویی بە پێنووسی یەكێك كە بەشداربووبێت لە ڕووداوەكاندا.

**commentator** (kom′ən-tā′tẽr), *n.* (١) ڕوونكەرەوە؛ كەسێك كە تێبینی خۆی دەنووسێت بۆ ڕوونكردنەوەی باسێك.
(٢) كەسێك كە پیشەی لێدووانە لە ڕووداو و دەنگوباسی ڕۆژانەی ژیان (بەتایبەتی لەسەر رادیۆو تەلەفزیۆن): ***(a news ~)***.

**commerce** (kom′ẽrs), *n.* (١) بازرگانی؛ ئاڵوویر.
(٢) ئاڵوگۆڕی كۆمەڵایەتی. (٣) [Rare]، جووت بوون؛ گان
*v.i.* پەیوەندی كەسێتی لەگەڵ گرتن یا كردن.

**commercial** (kə-mũr′shəl), *adj.* (١) بازرگانی:
***(The two sides signed a ~ agreement.)***
(٢) شتومەكی خاوی كۆ كە بەرهەم دەهێنرێ و دەفرۆشرێت بە دەزگا پیشەسازی‌یەكان بۆ بەكارهێنانی. (٣) ڕەشۆكی؛ بازاڕی.
(٤) مەبەستی قازانج و پارەیە؛ هەر بۆ پارەو قازانج دەكرێت:
***(a ~ painter or artist)***
(٥) سەرپەرشتی دەكرێت لەلایەن جاڕچی‌یانەوە: ***(~ television)***.
***n.*** جاڕ (لەسەر رادیۆ یا تەلەفزیۆن).

**commercial art,** هونەری بازرگانی: بەرهەمێكی هونەری‌یە كە هونەرمەند بەمەبەستی پارەو قازانج و فرۆشتن بیكات (بەتایبەتی بۆ جاڕدان).

**commercial college,** كۆلیجی كاروبار: قوتابخانەی دەفتەرگرتن و چاپكردن و شتی تری وەها.

**commercialism** (kə-mũr′shəl-iz′m), *n.* (١) بازرگانێتی؛ گیان و ڕێ‌وشوێن و كردەوەو ئامانجی بازرگانێتی.
(٢) لە ئەندازە بەدەر بەتەنگەوەهاتنی قازانج و پارە

-commercialist *(n.)*; **commercialistic** *(adj.)*.

**commercialize** (kə-mũr′shəl-īz′), *v.t.* (١) بەكارهێنانی ڕێ‌و- شوێن و ڕێبازی بازرگانی. (٢) كردنی شتێك تەنها بۆ قازانج؛ گوێ نەدان بە هیچ شتێك تەنها قازانج نەبێت. (٣) گوێ نەدانە چاكی بەرهەمێك لەبەر قازانج.
(٤) وەك شتی فرۆتەنی لێكردن؛ وەك كەل‌وپەل لێكردن كە دەتوانرێ بكڕرێت و بفرۆشرێت؛ سووك كردن؛ شكاندن: ***(They ~ sex.)***.

-commercialization *(n.)*.

**commercial paper,** چەك، کۆمپیالە، حەواڵە... هتد کە لە کاروباری بازرگانیدا بەکاردەهێنرێ

**commercial traveler,** [British], فرۆشیاری گەڕۆك.

**comminate** (kom′ə-nāt′), *v.t. & v.i.* (١) هەڕەشەلێکردن بە لەعنەت لێکردن و لە کڵێسە دەرکردن؛ هەڕەشەلێکردن.
(٢) لەعنەت لێکردن و دەرکردن لە کڵێسە.

**commination** (kom′ə-nā′shən), *n.* (١) هەڕەشەلێکردن بە لەعنەت لێکردن و دەرکردن لە کڵێسە؛ هەڕەشە
(٢) لەعنەت لێکردن و لە کڵێسە دەرکردن.

**commingle** (kə-miŋ′g'l), *v.t. & v.i.* تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵاوبوون.

**comminute** (kom′ə-nūt′, kom′ə-nōōt′), *v.t.* هاڕین؛ ووردکردن؛ کردن بە خۆڵ

**-comminution** *(n.).*

**commiserate** (kə-miz′ēr-āt′), *v.t.* هاوخەمی کردن؛ دڵخۆشی دانەوە؛ هاوسۆزی کردن.

**commiseration** (kə-miz′ēr-ā′shən), *n.* هاوخەمی کردن؛ هاوخەمی؛ دڵخۆشی دانەوە؛ هاوسۆزی.

**-commiserative** *(adj.).*

**commissar** (kom′ə-sär′), *n.* (١) سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی‌یەك یا وەزارەتێك لە یەکێتی سۆڤیەتی جاراندا. (٢) کاربەدەستێکی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی جاران کە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی حیزب و دابینکردنی جەماوەرو بەردەوامی دڵسۆزی جەماوەر بۆ حیزبی پێ سپێردراوە؛ کەسێك کە لە ڕەووشت و هەڵدانیدا بۆ دابینکردنی خەڵك لە کاربەدەستێکی وەها بچێت.

**commissariat** (kom′ə-sâr′i-ət), *n.* (١) بەڕێوەبەرایەتی ئازووقە لە سوپادا. (٢) ئازووقە. (٣) ئەرك و فەرمانگەی کۆمیسار (ووشەی پێشوو ببینە). (٤) تاقمێك کۆمیسار. (٥) بەڕێوەبەرێتی‌یەك لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران کە ئێستا پێی دەووترێ " وەزارەت "

**commissary** (kom′ə-ser′i), *n.* (١) فەرمانبەرێك کە دەسەڵاتێکی پێ درابێت و نوێنەری دەزگایەك بێت (وەك: کۆمیسار لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران، کاربەدەستێکی گەورەی پۆلیس لە فەرەنسا، نوێنەری سەرەك قەشە).
(٢) ئەفسەری ئازووقە (سوپا)؛ فەرمانگەو فەرمانبەرانی ژێردەستی ئەم ئەفسەرە.
(٣) دووکانی ئازووقە لە ئۆردووگایەکدا.

**commission** (kə-mish′ən), *n.* (١) دەسەڵات؛ دەسەڵات پێدانێك بۆ جێبەجێکردنی کارێك یا ئەرکێك؛ دەسەڵات پێدان.
(٢) بڕوانامە یا فەرمانی پێدانی ئەم دەسەڵاتە.
(٣) دەسەڵاتی جێگری کردن.
(٤) ئەرکێك (کە یەکێك دەسەڵاتی دراوەتێ بیکات یا بیبینێ لەبری یەکێکی تر).
(٥) لیژنە؛ لیژنەیەکی تایبەتی کە دەسەڵاتی دەدرێتێ بۆ جێبەجێکردنی کارێك یا لێکۆڵینەوەی شتێك.
(٦) کردنی کارێك یا شتێك *( ~ of a crime)* .
(٧) ئەو کارەی دەکرێت.
(٨) مز: کۆمسیۆن؛ بەشی فرۆشیار: ئەو بەشە یا پارەیەی کە کۆمپانی‌یەك دەیدات بە فرۆشیارێکی بۆ فرۆشتنی شتومەکی کۆمپانی‌یەکە یا بینینی ئەرکێك (زیاد لە مووچە یا هەندێ جار لەباتی مووچە).
(٩) بڕوانامەی پێدانی پلەی ئەفسەری لە هێزی چەکداردا بە کەسێك؛ ئەم پلەیەو دەسەڵاتەکەی.
*v.t.* (١) دەسەڵات پێدان بۆ جێبەجێکردنی کارێك یا بینینی ئەرکێك.
(٢) داوالێکردن (٣) خستنە بەر کاری پاپۆڕێك لە هێزی دەریاییدا.

**in commission,** (١) لەژێر کاردایە (پاپۆڕی جەنگی)؛ لە کارکردندایە.
(٢) کاری پێ دەکرێت؛ کار دەکات؛ بەکەڵکی بەکارهێنان دێت

**out of commission,** (١) لە کارکردندا نی‌یە (پاپۆڕی جەنگی)؛ لەژێر کاردا نی‌یە (٢) کاری پێ ناکرێت؛ بەکار نەماوە؛ بەکار نایەت؛ پەکی کەوتووە؛ شکاوە.

**commissionaire** (kə-mish′ən-âr′), *n.* دەرگاوان؛ بەردەست.

**commissioned** (kə-mish′ənd), *adj.* پلەی ئەفسەرێتی دراوەتێ لە هێزی چەکداردا.

**commissioner** (kə-mish′ən-ēr), *n.* (١) دەسەڵات پێدراو؛ کەسێك کە لیژنەیەك دەسەڵاتی جێبەجێکردنی کارێکی دەداتێ
(٢) ئەندامی لیژنەیەك.
(٣) کاربەدەستێکی گەورەی میری کە دەزگایەك بەڕێوە دەبات:
*( a ~ of highways)*
(٤) سەرپەرشتیاری یەکێك لە یاری‌یە وەرزشی‌یەکانی وولاتێك:
*( a baseball ~ )*
(٥) ئەندامی بەڕێوەبەری لیژنەیەکی ڕامیاری ناوچەیەك.

**-commissionership** *(n.).*

**commission merchant,** بازرگانی سەوداگەرێتی: کەسێکە کە شتومەك دەکڕێت و دەفرۆشێت بۆ خەڵك بە پارە.

**commissure** (kom′ə-shoor′), *n.* (١) هێڵ یا شوێنی بەیەك-گەیشتنی دوو شت؛ تێپك؛ جەمسەر. (٢) ئەو دەزوولە دەمارانەی بەشی ڕاست و چەپی مێشك بەیەك دەگەیێنن و هەروەها هی بڕبڕاگەی پشتیش.

**commit** (kə-mit′), *v.t.* (١) کردن: *( to ~ a crime)* .
(٢) پێ سپاردن؛ دانە دەست.
(٣) خستنە بەندیخانە، نەخۆشخانە، یا ژێر چاودێری‌یەوە:
*( He was ~ted to prison.; She was ~ted to a mental hospital.)*
(٤) هەڵگرتن، تۆمارکردن، یا لەبەرکردنی بۆ دواڕۆژ: *( to ~ to memory)* .
(٥) بەڵێندان (بۆ کردنی کارێك)؛ بەڵێن یا پەیمان دان بە کەسێك یا دڵ پێدانی
(٦) ناردنی گەڵاڵەی یاسایەك بۆ لیژنە (پەرلەمان).

**commit suicide,** خۆکوشتن.

**commit to memory,** لەبەرکردن؛ ڕەوانکردن (هەڵبەست، ووتار... هتد).

**commit to paper (or writing),** نووسین؛ تۆمارکردن لەسەر کاغەز؛ خستنە سەر کاغەز.

**-committable** *(adj.).*

**commitment** (kə-mit′mənt), *n.* (١) پێ سپاردن؛ دانە دەست.
(٢) خستنە بەندیخانە یا نەخۆشخانەی نەخۆشی مێشکەوە.
(٣) فەرمانی دادگا بە خستنە بەندیخانەی کەسێکەوە.
(٤) بەڵێنێك یا ڕێکەوتنێکی دارایی.
(٥) ناردنی گەڵاڵەی یاسایەك بۆ لیژنە (پەرلەمان).
(٦) بەڵێن؛ شتێك کە بە بەڵێن درابێت بە کەسێك.
(٧) پەیمانی بەردەوامی پەیوەندی و دڵسۆزی و لەخۆبوردن و خۆشەویستی بۆ مرۆڤێك، ڕێبازێك، کارێك یا بیروباوەڕێك:
*( He feels a deep ~ to her.; She feels a deep ~ to liberal policies.; His ~ to work is unshakable.)*

**committal** (kə-mit′'l), *n.* = **commitment.**

**committee** (kə-mit′i), *n.* (١) لیژنە؛ کۆمیتە.
(٢) پێ سپێردراو (زەوی‌وزار، منداڵ، کەسێکی بێکارە).

**in committee,** لەبەردەمی لیژنەدایە بۆ لێکۆڵینەوە (گەڵاڵەی یاسا).

**committeeman** (kə-mit′i-mən), *n.* ئەندامی لیژنە یا کۆمیتە.

**committeewoman** (kə-mit′i-woom′ən), *n.* ئەندامی ژنی لیژنە یا کۆمیتە.

**commix** (kə-miks′, ko-miks′), *v.t. & v.i.* تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵاوبوون.

**commixture** (kə-miks′chēr, ko-miks′chēr), *n.* تێکەڵاو؛ تێکەڵ؛ ئاوێتە؛ هەمەچەشن.

**commode** (kə-mōd′), *n.* (١) سەرپێچی ژنانە (کە لە کۆندا باوبوو).
(٢) دۆڵابێکی ڕازێنراوەی نزم. (٣) دەستشۆرێکی جووڵێنراوی سەر سێپا.
(٤) دەفری جووڵێنراوی میز (لە ژووری نووستندا)؛ کورسی‌یەك کە دەفرێکی وەهای تێدایە. (٥) ئاودەست (هی لەسەر دانیشتن)؛ ئاودەستخانە.

**commodious** (kə-mō′di-əs), *adj.* (١) فراوان؛ گەورە.
(٢) شیاو؛ گونجاو؛ باش.

**commodity** (kə-mod′ə-ti), *n.* شتومەك؛ کەل‌وپەل؛ فرۆتەنی؛

شتێك كه دەكڕێت و دەفرۆشرێت؛ كالا

**commodore** (kom′ə-dôr′, kom′ə-dōr′), *n.* (١) پلەیەكی بەرزی ئەفسەرییە لە هێزی دەریایی ئەمەریكادا.
(٢) ئەفسەرێكی هێزی دەریایی ئینگلیزی.
(٣) ناوێكی ڕێزلێگرتنە دەدرێت بە سەرۆكی یانەی خاوەن یەخت و بەلەمەكان و بە كاپتنی كەشتییەكی بازرگانی.

**common** (kom′ən), *adj.* (١) هاو؛ وەك یەك: *( The five of us have ~ interests.)*
(٢) گشتی. (٣) ناوكۆ؛ گشتی؛ هاوبەشی؛ هی هەموو كەسە.
(٤) بڵاو؛ باو.
(٥) ئاسایی؛ شتێك كە زوو زوو ڕوودەدات یا ببینرێ:
*( a ~ sight; a ~ occurence)*
(٦) بێ پلە: *( a ~ soldier)*
(٧) بازاڕی؛ هەڕەمە؛ ڕەشۆكی.
(٨) ناوی شتێكی ناتایبەتی (ڕێزمان): **( book, apple, chair, street )** .
ڕەگەزی نێر یا مێ (ڕێزمان): *( "Child" is of ~ gender.)* .
(٩) هاوژێرە (بیركاری).
*n.* (١) *(pl)* ، جەماوەر؛ خەڵك؛ بۆرەپیاوان؛ میللەت.
(٢) (sometimes *pl.*)، زەوی‌وزاری ناوكۆ یا گشتی؛ كێڵگە یا باخچەی گشتی (٣) مافی كەسێك لە خانوو، زەوی‌وزار یا ئاوێكدا هەروەك خاوەنەكەی.
(٤) نوێژێكی تایبەتی (كڵێسە).

**-commonness** *(n.).*

**by common consent,** بە ڕای هەموو؛ بە ڕای گشت كەس.

**in common,** ناوكۆ؛ هی هەمووكەسێكە؛ هاوبەش.

**commonage** (kom′ən-ij), *n.* (١) مافی لەوەڕاندنی مەڕومالات لە لەوەڕگای دێكەدا (٢) ناوكۆیەتی زەوی‌وزارو لەوەڕگا... هتد.
(٣) زەوی‌وزارو لەوەڕگای ناوكۆ یا هی هەمووكەس.
(٤) جەماوەر؛ بۆرەپیاوان؛ خەڵك؛ گەل.

**commonalty** (kom′ən-əl-ti), *n.* (١) جەماوەر؛ خەڵك.
(٢) بۆرەپیاوان؛ چینە نزمەكانی كۆمەڵ (٣) بەشدارگە؛ ئەندامانی بەشدارگە.

**common carrier,** كۆمپانی گواستنەوەی گشتی: كۆمپانی یا كەسێك كە خەڵك و شتومەك بە پارە دەگوێزێتەوە (پێی دەڵێن: " common " چونكە ئەبێ بەبێ جیاوازی كردن كار بۆ هەمووكەس بكات).

**common denominator,** (١) هاوژێرە (بیركاری).
(٢) شتێك كە چەند كەس، ڕێكخراو، وڵاتێك هەمان ڕایان هەیە دەربارەی و لەسەری ڕێك دەكەون.

**common divisor,** ژێری ناوكۆ (بیركاری).

**commoner** (kom′ən-ēr), *n.* (١) بۆرەپیاو؛ ئەندامێكی گەل یا جەماوەر. (٢) كەسێك كە بەگزادە نەبێت.
(٣) [Rare]، ئەندامی پەرلەمانی ئینگلیزی (ئەنجوومەنی جەماوەری).

**common fraction,** كەرتی ئاسایی (بیركاری).

**common law,** یاسای ئاسایی: یاسای نەنووسراوە كە خەڵكی وڵاتێك لەسەری دەڕۆن و لە كەلەپوور و نەریت و كلتوور و سەلیقەی ئەو میللەتەوە هەڵقوڵاوە.

**common-law marriage,** ژن‌ومێردی یا مارەكردنێك كە بریتییە لە ژیانی ژن و پیاوێك بەیەكەوە وەك ژن و مێرد بەبێ مارەبڕینیان لەیەكتری بەشێوەیەكی ئاینی یا لە دادگا.

**commonly** (kom′ən-li), *adv.* بەئاسایی؛ بەگشتی؛ بەشێوەیەكی ئاسایی

**common man,** یەكێك لە میللەت یا جەماوەر؛ كەسێكی ئاسایی؛ بۆرەپیاو.

**Common Market,** بازاڕی هاوبەش یا گشتی: یەكێتی یا یەكگرتنێكی ئابوورییە لەنێوان وڵاتە ئەورووپییەكاندا.

**common multiple,** چەندجارەی ناوكۆیی.

**common people,** جەماوەر؛ میللەت؛ خەڵك؛ خەڵكی سادە؛ بۆرەپیاوان.

**commonplace** (kom′ən-plās′), *n.* (١) وتەیەك یا تێبینییەكی ووشك و كۆن و بێ تام؛ وتەیەكی هیچ‌وپووچ
(٢) شتێكی ئاسایی و سەرنج ڕانەكێش: *( The airplane is now a ~ .)* .
*adj.* ئاسایی؛ كۆن و سوواو؛ بێ تام؛ هیچ‌وپووچ

**commons** (kom′ənz), *n.pl.* (١) جەماوەر؛ بۆرەپیاوان؛ خەڵكی سادە؛ میللەت بێجگەلە بەگزادەكان. (٢) ژەمی خواردەمەنی كە دەدرێت بە كۆمەڵێك خەڵك پێكەوە. (٣) ئەم جۆرە خواردەمەنییە كە كۆلیج یا زانكۆیەك دەیدات بەو قوتابیانەی لەناو زانكۆكەدا دەژین. (٤) چێشتخانە یا هۆڵی نانخواردنی ئەو قوتابیانەی لەناو زانكۆدا دەژین.

**the Commons,** *Also* **the House of Commons,** پەرلەمانی ئینگلتەرە و كەنەدا.

**common school,** قوتابخانەیەكی سەرەتایی گشتی خۆڕایی.

**common sense,** سەلیقە؛ شارەزایی زگماكی.

**commonweal** (kom′ən-wēl′), *n.* خێرو خۆشی هەمووان؛ قازانجی هەمووان؛ چاكەی گشتی.

**commonwealth** (kom′ən-welth′), *n.* (١) میللەت؛ دانیشتووانی وڵاتێك. (٢) وڵاتێك كە گەلەكەی خۆی خۆی بەڕێوەبەرێت؛ دیموكراسی؛ حوكمڕانی گەل. (٣) [-C]، كۆمنوێڵس: یەكێتی وڵاتەكانی سەر بە بەریتانیا؛ هەریەكێك لەم وڵاتانە بەتایبەتی كە ناسراوە بە: " Commonwealth of Australia " . (٤) یەكێك لە ویلایەتەكانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا (بەتایبەتی ویلایەتی: كێنتەكی، مارێلاند، ماساچوستس، پەنسلڤانیا و ڤەرجینیا). (٥) چەند وڵاتێك كە یەك دەگرن لەپێناوی قازانجی هەموویاندا. (٦) [.Obs]، قازانجی گشتی؛ خێرو خۆشی هەمووان.

**the Commonwealth,** فەرمانڕەوایی ئینگلتەرە لە سەردەمی كرۆموێڵ و كوڕەكەیدا (ساڵی ١٦٤٩–١٦٦٠) .

**commotion** (kə-mō′shən), *n.* هەراوهوریا؛ پشێوی؛ ئاشووب؛ جم‌وجووڵ؛ ئاژاوە.

**commove** (kə-mōōv′), *v.t.* هێنانەجۆش؛ بزواندن؛ هێنانە جم‌وجووڵ.

**communal** (kom′yoo-n'l, kə-mū′n'l), *adj.* (١) تایبەتی بە كۆمەڵێك خەڵك كە پێكەوە دەژین. (٢) ناوكۆیی؛ هی هەمووكەسە؛ پێكەوە

**communalism** (kom′yoo-n'l-iz'm, kə-mū′n'l-iz'm), *n.* شێوەیەكی حوكمڕانییە كە سەربەخۆیی ناوخۆیی دەدات بە هەموو كۆمەڵگا یا كۆمەڵە خەڵكێك كە پێكەوە دەژین لە ناوچەكانی وڵاتدا.

**-communalist** *(n.)*; **communalistic** *(adj.).*

**communalize** (kom′yoo-n'l-īz′, kə-mū′n'l-īz′), *v.t.* كردن بە موڵكی هەمووكەس؛ كردن بە هی گشتی؛ ناوكۆیی كردن.

**commune** (kə-mūn′), *v.i.* (١) وتووێژی گیانی بە گیانی لەگەڵدا كردن؛ دڵی خۆ بۆ هەڵڕشتن؛ لەنزیكەوە لەگەڵ دووان؛ لێ نزیكبوونەوەیەكی گیانی و هۆشی؛ هاوبەشی كردنی كەسێك یا چەند كەسێكی تر لە هەست و نەست و بیروباوەڕ و خۆشی و ناخۆشیدا؛ پەیوەندی گیانی لەگەڵ بەستن.
(٢) بەشداربوون لە شێوی خودایی لە كڵێسەدا؛ بەشداربوون لە باو و نەریتێكی ئایینیدا لە كڵێسە كە بریتییە لە خواردنی پارچە نانێكی بچووك كە قەشە لە شەرابی پیرۆزی هەڵدەكێشێت و دەیداتە دەست.
*n.* وتووێژێكی گیانی بە گیانی؛ دڵی خۆ هەڵڕشتن بۆ یەكتری؛ لەیەك نزیكبوونەوەیەكی گیانی و هۆشی.

**commune with oneself,** بیركردنەوە؛ لە خۆ نزیكبوونەوە.

**commune** (kom′ūn), *n.* (١) جەماوەر؛ بۆرەپیاوان.
(٢) كۆمەڵێك خەڵك كە لە یەك گەڕەك یا شاردا بژین.
(٣) بچووكترین ناوچە كە سەربەخۆیی ناوخۆیی هەبێت لە هەندێك لە وڵاتەكانی ئەورووپادا وەك فەرەنسا، ئیتاڵیا، بەلجیكا و سویسرا.
(٤) كۆمەڵگەیەكی بچووكی لادێیە ئەندامەكانی هەمان بیروباوەڕیان هەیە بەرامبەر بە ژیان لە خانوویەكی گەورە یا چەند خانوویەكدا دەژین و هەرچی

زەوی‌وزارو سامانیان هەیە هاوبەشی‌یە لەنێوانیاندا.

**the commune,** کۆمیونی پاریس (١) لیژنەیەکی شۆڕشگێڕیی بوو کە حوکمڕانی پاریسی دەکرد لە ساڵی ١٧٨٩-١٧٩٥

(٢) فەرمانڕەوایی شۆڕشگێڕیی پاریس لە ساڵی ١٧٨١دا کە نزیکەی دوو مانگی خایاند.

**communicable** (kə-mū'ni-kə-b'l), ***adj.*** (١) دەردەبڕدرێت؛ دەتوانرێت دەربڕدرێت (بیروباوەڕ)

(٢) درمی: لە کەسێکەوە تووشی کەسێکی تر دەبێت (نەخۆشی):

***( a ~ disease)***

(٣) [Archaic] زۆرووێژ؛ چەنەباز.

**-communicability** ***(n.).***

**communicant** (kə-mū'ni-kənt), ***n.*** (١) بەشداربوویەک لە- " communion " دا (ئەم ووشەیە ببینە). (٢) ڕاگەیێنەری دەنگوباس.

**communicate** (kə-mū'nə-kāt'), ***v.t.*** (١) پەیوەندی لەگەڵ کردن؛ پێ ڕاگەیاندن (دەنگوباس، نامە، فەرمان، پەیام، بیروڕا)؛ ووتووێژکردن؛ گەیاندن (نامە، سپاردە) (٢) پێ گەیاندن (نەخۆشی): ***( to ~ disease)*** .

***v.i.*** (١) بەشداربوو لە " communion " دا یا پێدرانی.

(٢) دان و وەرگرتن (دەنگوباس، سپاردە، نامە، پەیام، نیشانە) بە ووتن و نووسین و نیشان نادرن؛ پەیوەندی کردن یا بەستن؛ لەگەڵ دووان:

***( He cannot ~ with people.; You can ~ by telephone.; Try to ~ with her.)***

(٣) پێکەوەبوون یا بەستران؛ هیچ لەنێواندا نەبوون:

***( The living room ~s with the dining room.)***

**communication** (kə-mū'nə-kā'shən), ***n.*** (١) ڕاگەیاندن؛ پێ گەیاندن (٢) ووتووێژ؛ پێدان یا پێدان و وەرگرتنی دەنگوباس و پەیام و نیشان بەهۆی ووتووێژو نووسین و نیشانەوە.

(٣) ئەو دەنگوباس و نامەو سپاردەو نیشانەی کە دەگەیەنرێت؛ پەیام.

(٤) ( /pl/ ). هۆی گەیاندن یا پەیوەندی کردن، بەتایبەتی: (ا) (pl.)، ڕێگەی ناردن و وەرگرتنی دەنگوباس و پەیام بە تەلەفۆن و تەلەگراف و ڕادیۆ... هتد.

(ب) ( /pl/ ). ڕێگەی گواستنەوەی لەشکرو ئازووقە.

(ج) ( /pl/ ). ڕێگاوبان؛ هۆی هاتوچۆ.

(٥) پەیوەندی. (٦) زانست و هونەری گەیاندن (زانکۆ).

**communication satellite,** مانگی دەستکردی پەیوەندی کردن یا گەیاندن (کە نامە یا نیشانەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەگەیەنێت).

**communicative** (kə-mū'nə-kā'tiv, kə-mū'ni-kə-tiv), ***adj.*** (١) قسەکەر؛ دەم ڕاست؛ بۆ قسە دانەماو؛ زۆرووێژ

(٢) تایبەتی بە ڕاگەیاندن یا گەیاندن.

**communicator** (kə-mū'nə-kā'tēr), ***n.*** گەیێنەر؛ ڕاگەیێنەر؛ پێ گەیێنەر (مرۆڤ، شت).

**communion** (kə-mūn'yən), ***n.*** (١) بەشداربوون؛ هاوبەش بوون (کردار، ڕووداو... هتد)؛ هاوبەشی. (٢) هاوبەشی کردنی کەسێک یا چەند کەسێکی تر لە هەست و نەست و بیروباوەڕ و خۆشی و ناخۆشیدا؛ ووتووێژێکی گیانی بە گیانی؛ دڵی خۆ بۆ هەڵڕشتن؛ لێ نزیکبوونەوەیەکی گیانی و هۆشی (لەگەڵ مرۆڤ یا سرووشتدا)؛ پەیوەندی گیانی بە گیانی.

(٣) پەیوەندی‌یەکی ئاینی نزیک یا بەهێز.

(٤) کۆمەڵە کەسێک کە هەمان ئاین و بیروباوەڕیان هەبێت.

(٥) [C-]. بەشداربوون لە باوو نەریتێکی ئاینییدا لە کڵێسە کە بریتی‌یە لە خواردنی پارچە نانێکی بچووک کە قەشە لە شەرابی پیرۆزی هەڵدەکێشێت و دەیداتە دەست.

**communiqué** (kə-mū'nə-kā'), ***n.*** بەیاننامە؛ ڕاگەیاندننامە؛ ڕاگەیاندن

**communism** (kom'yoo-niz'm), ***n.*** کۆمیونیزم؛ شیوعیەت. فەلسەفەو ڕێبازی شیوعیەت کە بریتی‌یە لە بوونی گەل بە خاوەنی هۆی بەرهەم-هێنان؛ فەلسەفەی مارکس و ئەنجلز.

**communist** (kom'yoo-nist), ***n.*** کەسێکی شیوعی؛ شیوعی.

***adj.*** کۆمیونیستی یا شیوعی؛ تایبەتی بە کۆمیونیست و کۆمۆنیزم.

**communistic** (kom'yoo-nis'tik), ***adj.*** کۆمیونیستی؛ شیوعی؛ تایبەتی بە کۆمیونیزم یا شیوعیەت.

**Communist Manifesto,** بەیاننامەی شیوعی یا کۆمیونیستی: نامیلکەیەکە مارکس و ئەنجلز ساڵی ١٨٤٨ بڵاویان کردەوە.

**Communist Party,** حیزبی شیوعی؛ حیزبی مارکسی- لینینی.

**community** (kə-mū'nə-ti), ***n.*** (١) کۆمەڵگا؛ کۆمەڵ؛ جەماوەر؛ کۆمەڵە خەڵک. (٢) ئەو شار، دێ، گەڕەک یا ناوچەیەی ئەم کۆمەڵە خەڵکەی تیادا دەژی. (٣) کۆمەڵێک گیاندار یا ڕووەک کە لە یەک شوێندا بژین

(٤) کۆمەڵێک خەڵک کە لە هەمان دەورووبەردا بژین و هەمان کارو هەوەس و حەزیان هەبێت: ***( a college ~ )*** . (٥) لێکچوون؛ هاوشێوەیی.

**community center,** مەڵبەندی کۆمەڵایەتی: خانوویەک یا چەند خانوویەکی پێکەوەیە کە دانیشتووانی گەڕەکێک، دێیەک یا شارێک هەرکاتێک بیانەوێت تێیدا کۆدەبنەوە بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی و کلتووری و ڕابواردن

**community chest (**or **fund),** سندووقی دارایی کۆمەڵگا: بریتی‌یە لەو پیتاکەی دانیشتووانی ناوچەیەک یا شارێک کۆی دەکەنەوە بۆ بەکارهێنانی بۆ پێویستی کۆمەڵایەتی شارەکە.

**community property,** ئەو موڵک و زەوی‌وزارەی کە ژن و مێردێک پێکەوە خاوەنی بن، واتە هی هەردووکیان بێت.

**communize** (kom'yoo-nīz'), ***v.t.*** (١) کردن بە موڵکی ناوکۆیی کۆمەڵگا. (٢) کردن بە کۆمیونیست یا شیوعی.

**commutable** (kə-mūt'ə-b'l), ***adj.*** دەگۆڕدرێت؛ دەگۆڕدرێتەوە؛ ئاڵوگۆڕ دەکرێت؛ کەم دەکرێتەوە (سزا) .

**commutate** (kom'yoo-tāt'), ***v.t.*** گۆڕینی تەووژمی کارەبا لە هی ناڕاستەوخۆوە بۆ هی ڕاستەوخۆ.

**commutation** (kom'yoo-tā'shən), ***n.*** (١) گۆڕین؛ گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن. (٢) گۆڕینی دانەوەی قەرز لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر (بەتایبەتی کردن بە قیست). (٣) هاتوچۆکردنی ڕۆژانەی کرێکارو فەرمانبەر لە دەرەوەی شارەوە بۆ شوێنی کارەکەی لەناو شار یا لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بەهۆی شەمەندەفەر، ئوتومبێل، یا فڕۆکەوە. (٤) گۆڕینی ناڕاستەی تەووژمی کارەبا.

(٥) کەمکردنەوەی سزای تاوانبارێک؛ سووک کردنی سزا؛ گۆڕینی سزایەک بە سزایەکی تر.

**commutation ticket,** بلیتی نرخ داشکاو: بلیتێکە کە خاوەنەکەی دەتوانێت بە شەمەندەفەر هاتوچۆی پێ بکات لەکاتی تایبەتیدا بە نرخێکی داشکاو.

**commutative** (kə-mū'tə-tiv, kom'yoo-tā'tiv), ***adj.*** تایبەت بە گۆڕینەوە یا ئاڵوگۆڕکردن.

**commutator** (kom'yoo-tā'tēr), ***n.*** ئامێری گۆڕینی تەووژمی کارەبا لە هی ناڕاستەوخۆوە بۆ هی ڕاستەوخۆ.

**commute** (kə-mūt'), ***v.t.*** (١) گۆڕین؛ گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن.

(٢) کەمکردنەوە یا سووک کردنی سزای تاوانبارێک.

(٣) گۆڕینی تەووژمی کارەبا لە هی ناڕاستەوخۆوە بۆ هی ڕاستەوخۆ.

***v.i.*** (١) ئاڵوگۆڕبوون. (٢) گۆڕینی شێوەی قەرزدانەوەو کردنی بە قیست.

(٣) هاتوچۆکردنی ڕۆژانەی کرێکارو فەرمانبەر لە ماڵەکەیەوە لە دەرەوەی شار بۆ شوێنی کارەکەی لەناو شار یا لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بە شەمەندەفەر، ئوتومبێل، یا فڕۆکە.

**commuter** (kə-mūt'ēr), ***n.*** هاتوچۆکەری ئیش؛ کەسێکە کە هەموو ڕۆژێک هاتوچۆ دەکات لە ماڵەکەیەوە لە دەرەوەی شار بۆ شوێنی کارەکەی لەناو شار بە شەمەندەفەر، ئوتومبێل، یا فڕۆکە.

**compact** (kəm-pakt'), ***adj.*** (١) پتەو؛ قایم؛ پەستراو؛ پێچراو.

(٢) گرد؛ سفت؛ شوێن کەم دەگرێت.

(٣) کورت؛ باش داڕێژراو (ڕستە): ***( a ~ sentence)*** .

(٤) پێکدێت لە؛ پێکهاتووە لە.

(٥) تایبەتی‌یە بە مۆدێلێکی ئوتومبێل کە بچووکترو سووکترە لە مۆدێلی ترو لێخوڕین و ڕاگرتنیشی کەمتری تێ دەچێت؛ هی ئوتومبێلی بچووک.

*v.t.* (۱) بەتوندی و گردی پێچانەوە
(۲) پەستنەوە بۆ ئەوەی جێگە کەمتر بگرێت
*n.* (۱) سنووقێکی بچکۆلەی ئارایشت. (۲) ئوتومبیلێکی بچووک.
(۳) پەیمان؛ ڕێکەوتن.

**companion** (kəm-pan′yən), *n.* (۱) هاوڕێ؛ ئاوەڵ؛ هاودەم؛
هاودەنگ؛ برادەر؛ یار؛ دۆست؛ هاوجێ (۲) بەردەست (ماڵ، گەشت)؛ یاوەر.
(۳) ئەندامێکی پلە نزمی کۆمەڵی سوارچاکان. (٤) هاونیلە؛ وەك؛ ئاوەڵ
*v.t.* لەگەڵدابوون؛ هاودەمی کردن

**companion** (kəm-pan′yən), *n.* پێ پیلکەی ناو پاپۆڕ.

**companionable** (kəm-pan′yən-ə-b'l), *adj.* هاودەمی خۆشە؛
لەگەڵ بوونی خۆشە؛ هاوڕێی چاکە.

**companionate** (kəm-pan′yən-it), *adj.* تایبەتی بە هاودەم یا
هاوڕێ؛ هاوڕێیی؛ هاودەمی؛ ئاوەڵی

**companionate marriage,** ژنومێردایەتی برادەری؛ بریتییە لە
ژنومێردایەتییەك کە ژن و مێردەکە منداڵیان نابێت هەتا دڵنیا نەبن کە دەتوانن
پێکەوە بمێننەوەو بەئاسانیش دەتوانن یەکتری تەڵاق بدەن.

**companionship** (kəm-pan′yən-ship′), *n.* (۱) هاوڕێیەتی؛
ئاوەڵێتی؛ هاودەمیتی؛ لەگەڵ یەکتردا بوون (۲) کۆمەڵێك لە هاودەمان.
(۳) نزمترین پلەی کۆمەڵی سوارچاکان.

**companionway** (kəm-pan′yən-wā′), *n.* (۱) پێ پیلکەی ناو
پاپۆڕ ۲ ئەو شوێنەی کە پێ پیلکەیەکی وەها گرتوویەتی.

**company** (kum′pə-ni), *n.* (۱) هاودەمی؛ ئاوەڵی؛ هاوڕێیەتی
(۲) کۆمەڵێك خەڵك؛ کۆمەڵ.
(۳) هاوڕێ *( People are judged by the ~ they keep.)* .
(٤) تیپ (گۆرانی، ئاواز)؛ تیپ (٥) کۆمپانیا.
(٦) ئەو بەشداربووانەی ناویان نابرێت لە ناوی کۆمپانیاکەدا:
*( John Smith and C~ )*
(۷) [Colloq.]. میوان: *( Are you having ~ tonight?)*
(۸) پەل (سوپا)
(۹) هەموو کەشتیوانی پاپۆڕێك.
**bear company,** لەگەڵدابوون؛ هاوڕێیەتی کردن.
**keep company,** هاوڕێیەتی کردن؛ هاودەمی کردن؛ هەمیشە لەگەڵدا
بوون
**part company,** جیابوونەوە؛ بە برادەری نەمان (دوو هاوڕێ).

**company union,** یەکێتی کرێکارانی کۆمپانیایەك کە بەشێك نەبێت
لە یەکێتی گشتی کرێکارانی وڵاتەکە؛ یەکێتییەکی کرێکاران کە لەژێر
دەستی خاوەن کاردا بێت.

**comparable** (kom′pĕr-ə-b'l), *adj.* (۱) بەراوورد دەکرێن
(۲) لەیەك دەچن؛ وەك یەك وان.

**comparably** (kom′pĕr-ə-bli), *adv.* (۱) لەڕووی بەراووردەوە
(۲) تارادەیەك

**comparative** (kəm-par′ə-tiv), *adj.* (۱) بەراووردکاری؛ بەراوورد؛
بەراووردی *( ~ literature)*
(۲) هەڵدەسەنگێنرێ بە بەراووردکردن لەگەڵ شتێکی تردا: *( ~ happiness)* .
(۳) پلەی دووەمی بەراووردی ئاوەڵناو یا ئاوەڵفرمان (ڕێزمان):
**( big- bigger; handsome- more handsome;**
**slowly- more slowly ) .**
*n.* پلەی دووەمی بەراووردی ئاوەڵناو یا ئاوەڵفرمان (ڕێزمان):
*( "Prettier" and "more beautiful" are the ~s of "pretty" and "beautiful" .)*

**comparative linguistics,** زمانەوانی بەراووردکاری؛ بەشێکە لە
زانستی زمان کە هەوڵ دەدات پەیوەندی لەنێوان زمانەکاندا بدۆزێتەوە.

**comparative literature,** ویژەی بەراووردکاری؛ بریتییە لە
بەراووردکردن یا لێکۆڵینەوەی ویژەی دوو نەتەوە یا زیاتر
**-comparatively** *(adv.)*.

**compare** (kəm-pâr′), *v.t.* (۱) ( **to** ~ )، لەیەکچوواندن؛ پیشاندانی
لەیەکچوونی دوو شت.
(۲) ( **with** ~ )، بەراووردکردن؛ پیشاندانی جیاوازی و لەیەکچوونی دوو شت.
(۳) بەراووردکردنی ئاوەڵناو یا ئاوەڵفرمان (ڕێزمان):
**( small- smaller; beautiful- more beautiful;**
**quickly- more quickly ) .**
*v.i.* **( ~ with ),** شان لە شان دان؛ هاوتابوون؛ هاوسەنگ بوون.
beyond (or **past** or **without** ) **compare,** بێ وێنە (لە باشی یا
خراپیدا)؛ وێنەی نییە

**comparison** (kəm-par′ə-s'n), *n.* (۱) بەراووردی؛ بەراووردکردن؛
بەراوورد؛ بەرامبەرکردن. (۲) لەیەکچوون؛ وەك یەك وابوون.
(۳) بەراووردی ئاوەڵناو یا ئاوەڵفرمان (ڕێزمان):
**( long-longer-longest; good-better-best;**
**slowly- more slowly- most slowly ) .**
**in comparison with,** ئەگەر بەراووردی بکەیت لەگەڵ؛
لەچاو ئەوی تر یا ئەوانی تردا.
**no comparison between,** زۆر جیاوازن؛ بەراوورد ناکرێن، واتە
یەکێکیان زۆر باشترە لەوی تریان.

**compart** (kəm-pärt′), *v.t.* بەش بەش کردن؛ خانە خانە کردن؛
کردن بە بەشی بچووك بچووك و جیاکردنەوەیان لەیەکتری؛ جیاکردنەوە

**compartment** (kəm-pärt′mənt), *n.* (۱) ژوور؛ خانە؛ بەش.
(۲) ژووری بچووکی نووستنی ناو شەمەندەفەر.

**compass** (kum′pəs), *v.t.* (۱) بەدەوردا گەڕان؛ بەدەوردا چوون یا
ڕۆیشتن. (۲) دەورەدان؛ ئابلۆقەدان. (۳) تێگەیشتن.
(٤) هێنانەدی؛ بەجێهێنان؛ بەدەستهێنان:
*( He was unable to ~ his ends.)*
(٥) پیلان گێڕان.
*n.* (۱) *(pl.)* ، پرگال. (۲) چێوە؛ کەمەرە. (۳) شوێنێکی دەورەگیراو.
(٤) مەودا؛ ڕادە. (٥) قیبلەنما؛ ڕێنوما. (٦) مەودای دەنگ یا ئاوازی مۆسیقا
(لە نزمترین دەنگ یا ئاوازەوە بۆ بەرزترین).
*adj.* خڕ؛ بازنەیی؛ نیوبازنە.
-compassable *(adj.)*.

**compass card,** پەپکەی قیبلەنما: کە دەرزی موگناتیسی قیبلەنماکەی
تێدایەو سی و دوو نیشانەی قیبلەنماکەو سێسەدو شەست بەشی بازنەکەی
لەسەر دیاریکراوە.

**compasses** (kum′pəs-iz), *n.pl.* پرگال.

**compassion** (kəm-pash′ən), *n.* هاوسۆزی؛ بەزەیی.

**compassionate** (kəm-pash′ən-it), *adj.* بەبەزەیی؛ بەسۆز؛
بەهەست.
*v.t.* بەزەیی پێداهاتنەوە؛ هاوسۆزی لەگەڵ کردن.
-compassionately *(adv.)*.

**compass plant,** ڕووەکی قیبلەنما: ڕووەکێکی گوڵ زەردە گەڵاکەی
بەرەو باکوورو باشوور دەڕوانێت.

**compass saw,** مشاری بڕینەوەی شتی چەماوە.

**compatibility** (kəm-pat′ə-bil′ə-ti), *n.* لەگەڵ یەك گونجان؛
گونجان؛ شیان.

**compatible** (kəm-pat′ə-b'l), *adj.* **( ~ with ),** گونجاو؛
دەگونجێت؛ لەگەڵ یەك دەگونجێن؛ شیاو.

**compatriot** (kəm-pā′tri-ət, kəm-pat′ri-ət), *n.* (۱) هاووڵات
یا هاونیشتمان. (۲) [Colloq.]، هاوڕێ؛ برادەر؛ هاوکار.
*adj.* هاووڵات؛ هاونیشتمان.

**compeer** (kəm-pêr′, kom′pêr), *n.* (۱) هاوسەنگ؛ هاوتا؛ هاوپلە
(۲) هاوڕێ؛ برادەر؛ هەڤاڵ.

**compel** (kəm-pel′), *v.t.* (۱) زۆرلێکردن. (۲) ناچارکردن.
(۳) بەزۆر کردن یا هێنانە دەست.

(٤) كۆكردنەوە یا خڕكردنەوە بەزۆر (مەڕومالات)
(٥) بەزۆر هێنانەبەر بارەوە؛ بەزۆر دابینكردن.
**compellation** (kom΄pə-lā′shən), *n.* (١) بانگ كردن بە ناو یا نازناوێكەوە (٢) ناو؛ نازناو.
**compend** (kom′pend), *n.* = a compendium.
**compendious** (kəm-pen′di-əs), *adj.* كورت و پوخت
**compendium** (kəm-pen′di-əm), *n.* كورتە؛ پوختە (باس)
**compensate** (kom′pən-sāt΄), *v.t.* (١) بۆ بژاردن (زیان)؛ قەرەبوو بۆ كردنەوە
*( The government ~d the owners for the land taken from them.)*
(٢) هەق كردنەوەی شتێك؛ هەق بۆ كردنەوە
(٣) هاوكێش كردن (مەكینەكاری) (٤) پڕكردنەوە (كەموكووڕی).
*v.i.* هەق بۆ كردنەوە؛ هەق كردنەوە؛ بۆ بژاردن.
**compensation** (kom΄pən-sā′shən), *n.* (١) بۆ بژاردن (زیان)؛ قەرەبوو بۆ كردنەوە؛ هەق بۆ كردنەوە. (٢) بژاردەی زیان؛ پاداشت.
(٣) داپۆشینی كەموكووڕییەك بە زیاتر نواندنی خوویەكی باش و پەسەندكراو (دەروونناسی).
(٤) هاوتاكردن؛ هەق كردنەوە یا پڕكردنەوە (بەتایبەتی ئەگەر ئەندامێكی لەش كەموكووڕی هەبێت ئەندامێك یا ئەندامەكانی تر چالاكتر دەبن و ئەو كەموكووڕییە پڕدەكەنەوە)
**compensator** (kom′pən-sā΄tẽr), *n.* (١) بژێرەر (مرۆڤ، شت)
(٢) ئامێری هاوكێش كردن (مەكینەكاری).
-compensatory *(adj.).*
**compete** (kəm-pēt′), *v.i.* (١) پێشبڕكێ كردن؛ ملەملێ كردن
(٢) بەربەرەكانێ كردن؛ هاوچاوی كردن
(٣) بەشداربوون لە ملەملێیەكدا (وەرزش).
**competence** (kom′pə-təns), *n.* (١) گوزەران؛ دەرامەت.
(٢) كارامەیی؛ بەتوانایی؛ لێهاتوویی؛ چالاكی.
**competency** (kom′pə-tən-si), *n.* competence.
**competent** (kom′pə-tənt), *adj.* (١) لێهاتوو؛ كارامە؛ بەتوانا؛ باش: *( a ~ doctor)* .
(٢) مام ناوەندی؛ نە زۆر نە كەم: *( a ~ understanding of the law.)* .
(٣) ( to ~ ) ڕێگەدراو؛ شیاو
**competition** (kom΄pə-tish′ən), *n.* (١) پێشبڕكێ؛ ملەملێ.
(٢) بەربەرەكانێ؛ هاوچاوی. *( Business ~ is strong.)* .
(٣) بەشداربوونی ملەملێیەك (وەرزش)
**competitive** (kəm-pet′ə-tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە ملەملێ یا پێشبڕكێ؛ تایبەتی بە بەربەرەكانێ. (٢) كەوتووەتە سەر ملەملێ؛ بە دانانی ئەوە بەلكو بە ملەملێ یا تاقیكردنەوەیە (فرمان، كار).
**competitor** (kəm-pet′ə-tẽr), *n.* هاوچاو؛ بەربەرەكانێكەر
*( a business ~ )*
**compilation** (kom΄p'l-ā′shən, kom΄pi-lā′shən), *n.* (١) دانان (فەرهەنگ، پەرتووك)؛ پێكەوەنان (فەرهەنگ، ڕاپۆرت)؛ نووسین؛ كۆكردنەوە؛ یەكخستن (فەرهەنگ) (٢) شتێكی كۆكراوە، دانراو، یا یەكخراو (فەرهەنگ، ڕاپۆرت، بروانامە، پەرتووك... هتد).
**compile** (kəm-pīl′), *v.t.* (١) دانان (فەرهەنگ، پەرتووك، ڕاپۆرت)؛ نووسین (٢) كۆكردنەوە و ڕێكوپێك كردن و یەكخستن (بروانامە، ڕاپۆرت، نووسراوی وێژەیی... هتد).
**complacence** (kəm-plā′s'ns), *n.* = complacency.
**complacency** (kəm-plā′s'n-si), *n.* پاڵ لێدانەوە؛ بێباكی؛ فەرامۆشی؛ لە خۆ ڕازی بوون
**complacent** (kəm-plā′s'nt), *adj.* پاڵ لێدەرەوە؛ پشت لێكەرەوە؛ بێباك؛ فەرامۆش؛ لە خۆ ڕازی.
**complain** (kəm-plān′), *v.i.* (١) سكاڵاكردن؛ بۆڵەبۆڵ كردن؛ گلەییكردن؛ كڕووزانەوە؛ ناڕەزایی دەربڕین. (٢) شكات كردن (لە دادگا).

**complainant** (kəm-plān′ənt), *n.* (١) سكاڵاكەر؛ بۆڵەبۆڵكەر؛ گلەییكەر. (٢) شكاتكەر (دادگا)؛ داواچی.
**complaint** (kəm-plānt′), *n.* (١) ناڕەزایی؛ گلەیی؛ بۆڵەبۆڵ (٢) سكاڵا. (٣) نەخۆشی. (٤) سكاڵانامە (دادگا)؛ شكات.
**complaisance** (kəm-plā′z'ns, kəm-plā′s'ns, kom′pli-zans΄), *n.* ناسكی؛ ڕەفتار جوانی؛ زمان شیرینی؛ دڵی خەڵك ڕاگرتن.
**complaisant** (kəm-plā′z'nt, kəm-plā′s'nt, kom′pli-zant΄), *adj.* ناسك؛ ڕەفتار جوان؛ زمان شیرین؛ دڵی خەڵك ڕاگر.
**complect** (kəm-plekt′), *v.t.* لەیەكەوە ئاڵۆسكاندن؛ ئاڵۆزاندن؛ لەیەكەوە ئاڵاندن.
**complected** (kəm-plek′tid), *adj.* [Colloq. or Dial.], ڕەنگی دەموچاو؛ پێستی وەهایە: *( dark- ~ ; light- ~ )* .
**complement** (kom′plə-mənt), *n.* (١) تەواوكردن؛ پڕكردن. (٢) ئەوەندەی پێویستە بۆ تەواوكردن. (٣) تاقمێكی تەواو.
(٤) یەكێك لەو دوو بەشەی یەكتری تەواو دەكەن.
(٥) تەواوكەر (ڕێزمان). (بۆ نموونە: وشەی: " president " لە ڕستەی " They elected him president. " ، هەروەها ووشەی: " pretty " لە ڕستەی: " She was pretty. " ) .
(٦) تەواوكەر (بیركاری): ژمارەی ئەو پلانەی كە دەبێت بخرێتە سەر گۆشەیەك تاكو ببێتە گۆشەی نەوەد پلەیی.
(٧) هەموو كەشتیوانی كەشتی یا پاپۆڕێك.
*v.t.* تەواوكردن؛ بوون بە تەواوكەری شتێك؛ لەگەڵدا گونجان و تەواوكردن
*( The wine ~s the delicious dinner.)*
**complemental** (kom΄plə-men′t'l), *adj.* = complementary.
**complementary** (kom΄plə-men′tẽr-i), *adj.* (١) تەواوكەر. (٢) یەكتری تەواو دەكەن؛ دوو شت كە بەبێ یەكتری ناتەواون، بەڵام كە یەكیان گرت یەكتری تەواو دەكەن.
**complementary angle,** دوو گۆشە كە پێكەوە گۆشەیەكی وەستاو یا گۆشەیەكی نەوەد پلەیی پێكدێنن.
**complementary colors,** ڕەنگی تەواوكەر: دوو ڕەنگ كە ئەگەر بە باشی تێكەڵاو بكرێن ڕەنگی سپی یا سپیكار پەیدا دەكەن (وەك ڕەنگی شینی سەوزكار و سوور).
**complete** (kəm-plēt′), *adj.* (١) تەواو؛ هەموو؛ سەرتاپا.
(٢) تەواوبوو؛ تەواو؛ كۆتایی هاتوو. (٣) زۆرباش؛ بەووردی یا باشی كراو
(٤) [Archaic]، كارامە؛ قاڵ؛ شارەزا.
*v.t.* (١) تەواوكردن؛ كەموكووڕی نەهێشتن؛ هەموو كردن بە یەك.
(٢) كۆتایی پێ هێنان (كار)؛ بەجێهێنان؛ تەواوكردن (كار)؛ بردنەسەر
**completely** (kəm-plēt′li), *adv.* بەتەواوی؛ هەمووی؛ بەیەكجاری؛ سەرانسەر؛ سەرتاپا.
**completion** (kəm-plē′shən), *n.* (١) تەواوكردن؛ بردنەسەر.
(٢) تەواوبوون؛ كۆتایی هاتن.
**complex** (kəm-pleks′), *adj.* (١) ئاوێتە؛ تێكەڵ.
(٢) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسكاو.
*n.* (١) شتێكی ئاوێتە یا تێكەڵ (٢) (ا) چەند هەست و بیروڕایەكی پەستراوە و داپۆشراو پێ نەزانراوی كەسێكە دەربارەی شتێك یا كەسێك یا ڕووداوێك كە كاردەكاتە سەر ڕەووشتی گشتی ئەو كەسە (دەروونناسی).
(ب) خولیا؛ نەخۆشی دەروونی (دەروونناسی).
**complex fraction,** كەرتی تێكەڵ (بیركاری).
**complexion** (kəm-plek′shən), *n.* (١) سرووشت و ڕەووشت (مرۆڤ). (٢) ڕەنگی پێست و دەموچاوی مرۆڤ؛ ڕەنگی دەموچاو؛ ڕەنگی پێست. (٣) ڕووخسار؛ دیمەن؛ ڕوواڵەت؛ شێوە.
**complexioned** (kəm-plek′shənd), *adj.* ڕەنگی دەموچاو و پێستی وەهایە: *( dark- ~ ; light- ~ )* .
**complexity** (kəm-plek′sə-ti), *n.* (١) ئاڵۆزی؛ ئاڵۆسكاوی.

(٢) شتێکی ئاڵۆز یا ئاڵۆسکاو.

**complex sentence,** ڕستەی ئاوێتە. ڕستەیەکە کە لە ڕستەیەکی سەرەکی یا سەربەخۆو ڕستەیەکی ناسەربەخۆ یا زیاتر پێکهاتبێت.

**compliable** (kəm-plī′ə-b'l), *adj.* = compliant.

**compliance** (kəm-plī′əns), *n.* ملدان؛ گونجان لەگەڵ؛ جووڵانەوە بەپێی پەیڕەو یا یاسایەکی دیاریکراو.

**in compliance with,** بەپێی یاسا یا پەیڕەوێک؛ بەگوێرەی.

**compliancy** (kəm-plī′ən-si), *n.* = compliance.

**compliant** (kəm-plī′ənt), *adj.* ملدەر؛ بەگوێرەی پەیڕەوو یاسای دیاریکراو بۆی دەجووڵێتەوە؛ ملکەچ؛ گوێ ڕایەڵ؛ پابەند.

**complicacy** (kom′plə-kə-si), *n.* = complexity.

**complicate** (kom′plə-kāt′), *v.t. & v.i.* ئاڵۆزکردن، ئاڵۆسکاندن؛ گران کردن. تەنگوچەڵەمە)؛ ئاڵۆزبوون.

*adj.* (١) [Archaic]. ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو.

(٢) لە باری درێژی لوول بوو یا نووشتاوە (گەڵای هەندێ ڕووەك یا باڵی مێروو).

**complicated** (kom′plə-kāt′id), *adj.* ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو؛ گران.

**complication** (kom′plə-kā′shən), *n.* (١) ئاڵۆزی، ئاڵۆزاوی؛ گیروگرفت. (٢) شتێکی ئاڵۆز یا ئاڵۆسکاو. (٣) هۆیەکی ئاڵۆزکەر.

(٤) لێ پیس کردن (نەخۆشی): نەخۆشییەکی تازە یا بارێکی نائاسایی کە تووشی نەخۆشێك دەبێت و دەبێت بەهۆی ئاڵۆزبوونی نەخۆشییەکەی و چاکبوونەوەی دوادەخات.

**complice** (kom′plis), *n.* [Archaic], = accomplice.

**complicity** (kəm-plis′ə-ti), *n.* (١) بەشداری لە تاوان، خراپە، یا بەدکاریدا. (٢) ئاڵۆزی؛ ئاڵۆسکاوی.

**complier** (kəm-plī′ēr), *n.* ملدەر؛ کەسێك کە لەسەر پەیڕەوو یاساو ڕێوشوێنی دیاریکراو بڕوات.

**compliment** (kom′plə-mənt), *n.* (١) ستایش؛ ڕێز؛ چاکە ووتنی کەسێك یا شتێك. (٢) ئافەرین. (٣) (*pl.*)، ڕێزو سڵاو:

*( Please accept this free offer with our ~s.)*

(٤) [Archaic or Dial.]، دیارییەك کە لە پاداشتی چاکەیەکدا دەدرێت.

*v.t.* (١) ستایش کردن؛ ڕێزلێنان؛ پیرۆزبایی لێکردن؛ ئافەرین کردن؛ پەسەندکردن بە ستایشەوە: *( He ~ed her on her pretty dress.)*.

(٢) پێدانی دیاری یا شتێك بە کەسێك بۆ پیشاندانی ڕێز بۆ ئەو کەسە.

**complimentary** (kom′plə-men′tēr-i), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕێزو ستایش و پەسەندکردن. (٢) بەخۆڕایی دەدرێت بۆ ڕێزی خۆ پیشاندان یا دانەوەی چاکەیەك (بلیتی سینەما، شانۆگەری، نامەنگ): *( a ~ ticket)*.

**complin** (kom′plin), *n. Also* **compline,** نوێژی ئێوارە یا خەوتن (خاچ پەرستی).

**complot** (kom′plot), *n.* پیلان

*v.t. & v.i.* پیلان گێڕان؛ پیلان دانان.

**comply** (kəm-plī′), *v.i.* ملدان؛ پەیڕەوی کردن؛ لەسەر یاساو پەیڕەوی دیاریکراو ڕۆیشتن؛ ملکەچ کردن؛ قایل بوون.

**compo** (kom′pō), *n.* شتێکی ئاوێتە وەك چیمەنتۆ یا قسڵو لەو ئاو کە تێکەڵ دەکرێت و دەگیرێتەوە بۆ خانوو دروستکردن؛ قسڵ؛ قوڕوقسڵ؛ گەچ.

**component** (kəm-pō′nənt), *adj.* بەشی پێکهێنەر؛ توخمی پێکهێنەر.

*n.* بەش؛ پارچە؛ توخم؛ کەرەسە.

**comport** (kəm-pôrt′, kəm-pōrt′), *v.t.* هەڵسان و دانیشتن یا جووڵانەوە بە جۆرێکی تایبەتی.

*v.i.* گونجان؛ لەگەڵ گونجان یا شیان.

*n.* [Obs.], هەڵسان و دانیشتن یا جووڵانەوە؛ ڕەووشت؛ ڕەفتار.

**comportment** (kəm-pôrt′mənt, kəm-pōrt′mənt), *n.* ڕەووشت؛ ڕەفتار؛ هەڵسان و دانیشتن؛ جووڵانەوە.

**compose** (kəm-pōz′), *v.t.* (١) پێکهێنان؛ دارشتن؛ دروستکردن.

(٢) دانان؛ هۆنینەوە؛ هەڵبەستن؛ ڕێکخستن؛ ئاوازدانان؛ دارشتن (هەڵبەست، هۆنراوە، چیرۆك، نۆپەرا، ئاوازی مۆسیقا):

*( He ~d a poem for the occasion.)*

(٣) بڕینەوە (ناکۆکی)؛ یەکلاکردنەوە:

*( Their differences were ~d peaceably.)*

(٤) هێمن کردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ: *( He couldn't ~ himself.)*

(٥) ئامادەکردنی تیپ (چاپەمەنی).

*v.i.* (١) دانان؛ هەڵبەستن؛ هۆنینەوە؛ دارشتن.

(٢) ئامادەکردنی تیپ (چاپەمەنی).

**composed** (kəm-pōzd′), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ سەلار.

-composedly *(adv.).*

**composer** (kəm-pōz′ēr), *n.* ئاوازدانەر.

**composing room,** ژووری ئامادەکردنی تیپ (چاپەمەنی).

**composite** (kəm-poz′it), *adj.* (١) ئاوێتە؛ تێکەڵاو؛ لە چەند بەش یا توخم پێکهاتوو. (٢) تایبەتی بە ڕووەکێك کە گوڵەکەی دەوری دراوە بە گەڵا (وەك گوڵەبەڕۆژە، چاوپشیلە... هتد)

*n.* (١) شتێکی ئاوێتە؛ شتێکی چەند توخمی.

(٢) ڕووەکێك کە گوڵەکەی گەڵا دەورەی دابێت (وەك گوڵەبەڕۆژە).

**composite number,** ژمارەی دابەش: ژمارەیەك کە بەسەر ژمارەیەکی تردا دابەش دەکرێت بەبێ ئەوەی هیچی بمێنێتەوە.

**composition** (kom′pə-zish′ən), *n.* (١) دانان؛ پێکەوەنان؛ یەکخستن؛ دروستکردن؛ پێکهێنان؛ دارشتن.

(٢) هۆنینەوە؛ هەڵبەستن (وێژە)؛ دارشتن؛ دانان. (٣) هەڵبەست؛ هۆنراوە.

(٤) پەخشان؛ نووسراوێك (بەتایبەتی هی قوتابی لە وانەی زماندا).

(٥) هەڵبەستێکی مۆسیقا؛ پارچەیەك مۆسیقا: *( a musical ~ )*

(٦) چۆنێتی پێکهێنانی شتێك و ئەو پارچە یا کەرەسانەی لێی پێکدەهێنرێت؛ کەرەسەی دارشتن یا دروستکردن و چۆنێتی ئەو دروستکردنە.

(٧) ڕێکەوتن؛ پێکهاتن؛ گونجان؛ بڕینەوەی ناکۆکی (بەتایبەتی هی کەسێکی نابووت کە قایل دەبێت بەشێك لە قەرزەکانی بداتەوە)

(٨) پێکهێنانی ووشە یا ڕستەی ئاوێتە (زمانەوانی).

(٩) ئامادەکردنی تیپ (چاپەمەنی).

**compositor** (kəm-poz′i-tēr), *n.* ئامادەکەری تیپ (چاپەمەنی).

**compost** (kom′pōst), *n.* (١) شتێکی تێکەڵاو یا ئاوێتە.

(٢) سەرەنوێلکێکی بچووکە لە کونجێکی باخچەیەکدا پەین و پاشماوەی سەوزەو شتی تری ئۆرگانیکی ڕزیوی تێدا کۆدەکرێتەوەو دەکرێتە ناو باخچەکەوە وەك پەین.

**composure** (kəm-pō′zhēr), *n.* هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ تێك نەچوون؛ خۆ تێك نەدان: *( Try to maintain your ~ .)*.

**compotation** (kom′pō-tā′shən), *n.* خواردنەوەی شتی مەستکەر پێکەوە لەگەڵ هاوڕێدا.

-compotator *(n.).*

**compote** (kom′pōt), *n.* (١) میوەی کوڵێنراو لەگەڵ شیلەدا.

(٢) دەفرێکی دەسکدار یا سێپادار کە لەسەر سێنیاکەی دادەنرێت و میوەو نوقڵ و شتی وەها تێ دەکرێت؛ دەفرێکە قنچکێکی درێژی هەیە لەسەر قنچکەکەی دادەنرێت و میوەو نوقڵ و شتی وەهای تێ دەکرێت.

**compound** (kom-pound′, kəm-pound′), *v.t.* (١) پێکەوەنان؛ تێکەڵاوکردن؛ یەکخستن. (٢) ڕێکەوتن؛ بڕینەوە (ناکۆکی).

(٣) ڕێکەوتن لەسەر دانەوەی قەرزێك بە دانەوەی تەنها هەندێك لە قەرزەکە.

(٤) کەڵەکەکردن؛ کۆمەڵ کردن؛ حساب کردنی قازانجی پارەیەك کە لە بانقدا دادەنرێت بە کۆکردنەوەی قازانجی پارەکە خۆی و قازانجی ئەو قازانجەش کە پارەکە دەیکات: *( The interest is ~ed daily.)*.

(٥) دەرمان گرتنەوە بەگوێرەی ڕەچەتە؛ ئامادەکردنی دەرمان بە تێکەڵاوکردنی چەند دەرمانێك.

(٦) زیادکردن؛ خستنە سەر.

*( He ~ed his financial difficulties by buying a new car.)*

*v.i.* (١) قایل بوون؛ ڕێکەوتن. (٢) ڕێکەوتن لەگەڵ خاوەن قەرزێکدا.

*adj.* ئاوێته؛ تێکەڵاو؛ لێکدراو؛ پێکهاتوو؛ داڕێژراو.

*n.* (١) دارشتە؛ داڕێژراو؛ ئاوێته. (٢) شتێك کە لە دوو توخم یا زیاتر پێکهاتبێت و تایبەخۆکانی ئەو توخمانە وون بێ لە شتە پێکهاتووەکەدا. (٣) ووشەی لێکدراو (ڕێزمان): ( blackboard ).

**compound a felony (or crime),** قایل بوون بە بەرتیل یا شتی وەها بۆ چاو نووقاندن لە تاوانێك و ئاگادار نەکردنی پۆلیس یا نەدانی تاوانبارەکە بە دادگا.

**compound** (kom′pound), *n.* خانوویەك یا چەند خانوویەکی پەرژین کراو یا جیاکراوە: (ا) لە وولاتانی ڕۆژهەلاتدا ئەو ناوچەیەی ئەورووپاییەکان (ب) لە وولاتانی ئەفەریقادا کوختەکانی خەڵکی وولاتەکە خۆی (ج) شوێنی ڕاگرتنی دەستبەسەرانی جەنگ.

**compound flower,** گوڵێکی گەڵا دەورەدراو (وەك گوڵەبەڕۆژە).

**compound fraction,** کەرتی تێکەڵ.

**compound fracture,** جۆرە ئێسقان شکانێکە کە ئێسقانەکە لە پێستەکەوە هاتبێتە دەرەوە.

**compound interest,** ئەو قازانجەی دەدرێت بە پارەیەك کە لە بانقدا دانراوە بە پارەکە خۆی و قازانجی قازانجەکەیشی

**compound leaf,** گەڵای دوو فلیقانە.

**compound number,** ژمارەی تێکەڵ هەندێکە کە بە دوو ژمارە دەربڕێت: وەك .4 ft., 7 in.; 1lb., 3 oz ).

**compound sentence,** ڕستەی لێکدراو

**comprador, compradore** (kom′prə-dôr′), *n.* کۆمپرادۆر: نوێنەر یا بڕواپێکراوێکی خۆولاتی دەزگایەکی بازرگانی یا کاروباری بێگانەیە کە سەرەوکاری کرێکارو مووچەخۆرە خۆولاتییەکانی پێ سپێردراوە.

**comprehend** (kom′pri-hend′), *n.* (١) چوونە مێشکەوە؛ تێگەیشتن: سەر لێ دەرچوون. (٢) گرتنەوە؛ تیابوون.

**comprehensible** (kom′pri-hen′sə-b'l), *adj.* مرۆڤ تێی دەگات؛ مرۆڤ دەتوانێت تێی بگات یا سەری لێی دەرچێت؛ دەچێتە مێشکەوە.

**comprehension** (kom′pri-hen′shən), *n.* (١) تێگەیشتن؛ توانای تێگەیشتن (٢) گرتنەوە؛ تێدابوون.

**comprehensive** (kom′pri-hen′siv), *adj.* (١) گشتگر؛ تێکڕا؛ گشتی (تاقیکردنەوە یا هەڵسەنگاندن):

*( a ~ examination; a ~ review of the situation)*

(٢) دەتوانێت باش تێ بگات.

**compress** (kəm-pres′), *v.t.* پەستن؛ پەستانەوە؛ گردکردنەوە؛ کورتکردنەوە یا پوخت کردن (نووسراو)؛ گوشین؛ بچووك کردنەوە؛ هێنانەوەیەك.

*n.* (١) پارچەیەك پەڕۆی تۆپەڵ یا قەدکراو (کە دەخرێتە سەر ئەندامێکی لەش بۆ پەستانەوەی) (٢) پارچەیەك پەڕۆی وەها دەرماناوی (کە دەخرێتە سەر ئەندامێکی هەوکردوو). (٣) مەکینەی پەستنەوەی لۆکە و گوریزەکردنی.

**compressed** (kəm-prest′), *adj.* (١) پەستراوە؛ گوشراو؛ گرد؛ کۆ. (٢) پان کراوە؛ تەخت کراو.

**compressed air,** هەوای پەستراوە.

**compressible** (kəm-pres′ɔ-b'l), *adj.* دەپەسترێتەوە

**compression** (kəm-presh′ən), *n.* (١) پەستان. (٢) پلەی پەستان (مەکینەی ئوتومبیل).

**-compressive** *(adj.).*

**compressor** (kəm-pres′ẽr), *n.* (١) پەستێنەر؛ گوشەر. (٢) ماسولکەی پەستێنەر. (٣) مەکینەی پەستانی هەوا یا گاز. (٤) ئامێرێکی نەشتەرگەری کە ئەندامێکی لەشی پێ دەپەسترێتەوە.

**comprise** (kəm-prīz′), *v.t.* (١) پێکهاتن لە (٢) گرتنەوە؛ تێدابوون؛ بەشێك بوون لە.

**compromise** (kom′prə-mīz′), *n.* (١) ڕێکەوتنێك کە بریتی بێت لە وازهێنان لە مافی خۆ؛ خۆفرۆشتن؛ سازش لەسەر کردن. (٢) بارێکی ناوەڕاستانە؛ چارەسەرێکی ناوەڕاستانە.

(٣) خستنە مەترسی لەکەداربوون، ناوپیس بوون یا ناچاربوون بە وازهێنان لە بیروباوەڕو هەڵوێست و مافی خۆ:

*( a ~ of one's good name and reputation)*

*v.t.* (١) ڕێکەوتن (لەڕێی وازهێنانەوە لە مافی خۆ)؛ سازش لەسەر کردن. (٢) وازهێنان لە مافی خۆ؛ قایل بوون بە کەمتر لە مافی خۆ؛ خۆفرۆشتن. (٣) خستنە مەترسی لەکەداربوون، ناوپیس بوون یا ناچاربوون بە وازهێنان لە بیروباوەڕو هەڵوێست و مافی خۆ:

*( By accepting the bribe, he ~d himself.)*

*v.i.* ڕێکەوتن؛ ڕێکەوتن بە وازهێنان لە مافی خۆ.

**compromiser** (kom′prə-mīz′ẽr), *n.* وازهێنەر لە مافی خۆ (لەڕێی ڕێکەوتن لەگەڵ بەرامبەرەکەی)؛ خۆفرۆش.

**comptometer** (komp-tom′ə-tẽr), *n.* ژمێرەر؛ پێژمێر.

**comptroller** (kən-trōl′ẽr), *n.* لێپرسراوی خەرجی دەزگایەك؛ چاودێری خەرجی؛ ژمێریار.

**compulsion** (kəm-pul′shən), *n.* (١) زۆرەملێ؛ زۆر؛ زۆردارەکی. (٢) خوتخوتە؛ ناچاربوونی کەسێك بە کردنی کارێك بەتایبەتی هی نابەجێ یا مندالانە بەهۆی هێزێکی دەروونییەوە کە پاڵی پێوەدەنێت و ناتوانێت بەرهەڵستی بکات؛ ئەو هێزە دەروونییەی کە بەرهەڵستی ناکرێت.

**compulsive** (kəm-pul′siv), *adj.* زۆرلەخۆکەر؛ تایبەتییە بە هێزێکی پاڵپێوەنەری دەروونی بەرهەڵست نەکراو.

**compulsory** (kəm-pul′sẽr-i), *adj.* زۆرەملێ؛ زۆردارەکی؛ بەزۆر؛ هەمووکەس دەگرێتەوە: *( ~ education)*.

**compunction** (kəm-puŋk′shən), *n.* هەست بە گوناهباری کردن؛ هەست بە بێ ویژدانی کردن؛ پەشیمانی؛ سەرزەنشتی دەروون.

-compunctious *(adj.).*

**compurgation** (kom′pẽr-gā′shən), *n.* بەخشین یا ئازادکردنی گومانبارێك لەسەر سوێندخواردنی چەند شایەتێك (دادگا).

**compurgator** (kom′pẽr-gā′tẽr), *n.* شایەتێك کە سوێند دەخوات لە دادگادا لەسەر بێ تاوانی گومانبارێك و دەبێتەهۆی بەرەڵاکردنی.

**computable** (kəm-pūt′ə-b'l, kom′pyoo-tə-b'l), *adj.* دەژمێررێت؛ دەتوانرێ بژمێررێت.

**computation** (kom′pyoo-tā′shən), *n.* (١) ژماردن؛ لێکدانەوە. (٢) ئەنجامی ژماردنێك.

**compute** (kəm-pūt′), *v.t. & v.i.* ژماردن؛ لێکدانەوە.

*n.* ژماردن؛ لێکدانەوە: *( beyond ~ )*.

**computer** (kəm-pū′tẽr), *n.* کۆمپیوتەر؛ ژمێرەری ئەلەکترۆنی؛ پێژمێری ئەلەکترۆنی.

**computerize** (kəm-pū′tẽr-īz′), *v.t.* بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە جێبەجێکردنی کاروباردا.

**comrade** (kom′rad, kom′rid), *n.* (١) هاوڕێ؛ برادەر؛ ئاوەڵ. (٢) [C-]، [Colloq.]، ئەندامێکی حیزبی شیوعی.

**comrade in arms,** ئاوەڵێکی سەرباز؛ ئاوەڵێکی چەك لە شان.

**comradeship** (kom′rad-ship′, kom′rid-ship′), *n.* ئاوەڵی؛ هاوڕێیی؛ برادەری.

**con** (kon), *adv.* دژ؛ دژ بە:

*( They argued the matter pro and ~ .)*

*n.* کەس، دەنگ یا بیرێکی دژ.

**con** (kon), *v.t.* بەووردی خوێندنەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ لەبەرکردن؛ ڕەوانکردن.

**con** (kon), *v.t.* لێخوڕینی بەلەم یا پاپۆڕێك.

*n.* (١) پلەی لێخوڕی بەلەم یا پاپۆڕ. (٢) لێخوڕینی بەلەم یا پاپۆڕێك

**con** (kon), *adj.* [Slang], [Short of confidence], ساختەچی؛ دەستبڕ؛ درۆزن: *( a ~ man)*.

*v.t.* دەستبڕین؛ هەڵخەڵەتاندن (لەڕێی بڕواپێکردنەوە):

*( He ~ned everybody into lending him money.)*

**con-** (kon), – **com-**.

**conation** (kō-nā′shən), ***n.*** هێزی ویستن و هەوڵدان و کوڵنەدان لە مرۆڤدا
**conatus** (kō-nā′təs), ***n.*** (١) هەوڵ؛ کۆشش
(٢) هێزێکی سرووشتی‌یە کە پاڵ بە گیاندارەوە دەنێت بۆ ویستن و هەوڵدان.
**concatenate** (kon-kat′′n-āt′), ***v.t.*** پێکەوەبەستن (زنجیر).
**concatenation** (kon′kat-′n-ā′shən), ***n.*** (١) پێکەوەبەستن (زنجیر) (٢) زنجیرە؛ زنجیرەیەك شت یا ڕووداوی پێکەوە بەستراو و پەیوەندیدار.
**concave** (kon-kāv′, kən-kāv′, kon′kāv), ***adj.*** قوپاو؛ چاڵ؛ بۆش و قوپاو
***n.*** ڕوویەك، هێڵێك یا شتێکی قوپاو.
***v.t.*** قوپاندن.
**concavity** (kon-kav′ə-ti, kən-kav′ə-ti), ***n.*** (١) قوپاوی؛ چاڵی
(٢) ڕوویەك یا شتێکی قوپاو.
**concavo-concave** (kon-kā′vō-kon-kāv′), ***adj.*** لە دوو لاوە قوپاو.
**concavo-convex** (kon-kā′vō-kon-veks′), ***adj.*** قوپاووقۆقز؛ لایەکی قوپاوە و لایەکی قۆقزە.
**conceal** (kən-sēl′), ***v.t.*** (١) شاردنەوە؛ داپۆشین؛ خۆداگرتن.
(٢) کردن بە ژێرەوە (دەنگوباس)؛ داپۆشین (دەنگوباس یا ڕووداو)؛ شاردنەوە.
**concealment** (kən-sēl′mənt), ***n.*** (١) شاردنەوە؛ داپۆشین؛ کردن بە ژێرەوە؛ کردن بە ژێر لێوەوە.
(٢) جێگای شاردنەوە؛ ڕێ‌وشوێنی شاردنەوە؛ شاردنەوە.
**concede** (kən-sēd′), ***v.t.*** (١) دان پیانان؛ پێ لێنان.
(٢) دان بە دۆڕاندن یا بەزیندا نان؛ دان بە سەرکەوتنی بەرامبەردا نان:
***( He ~d defeat.)***
***v.i.*** وازهێنان لە ماف؛ سەر دانەواندن.
**conceit** (kən-sēt′), ***n.*** (١) بیر؛ ڕا؛ بیروباوەڕ
(٢) گومڕایی؛ فیز؛ لووت بەرزی؛ لەخۆبایی‌بوون
(٣) دەستەواژە (وێژە، هۆنراوە). (٤) خەیاڵ.
***v.t.*** (١) [Obs.] بیرکردنەوە؛ هێنانە بەرچاوی خۆ.
(٢) [Dial.] خۆش ویستن؛ حەزلێکردن؛ بەدڵ بوون.
**out of conceit with,** لەبەرچاوکەوتن
**conceited** (kən-sē′tid), ***adj.*** گومڕا؛ لووت بەرز؛ بەفیز؛ لەخۆبایی
**conceivable** (kən-sēv′ə-b′l), ***adj.*** دەشێت؛ بۆی هەیە؛ لەوانەیە؛ دەچێتە مێشکەوە
**-conceivably** ***(adv.).***
**conceive** (kən-sēv′), ***v.t.*** (١) سکپڕبوون بە؛ سکپڕبوون
***( She ~d a child.)***
(٢) هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بۆچوون؛ لە مێشکدا دروستکردن؛ بیرلێکردنەوە.
(٣) تێگەیشتن. (٤) دەربڕین (بە قسە یا بە نووسین).
***v.i.*** (١) سکپڕبوون
(٢) ( of ~ ) لە مێشکدا دروست بوون؛ بیرلێکردنەوە؛ هێنانە بەرچاو.
**concentrate** (kon′s′n-trāt′, kon′sen-trāt′), ***v.t.*** (١) کۆمەڵ کردن لە ناوچەق یا ناوەڕاستدا؛ کۆکردنەوە لە ناوجەرگەدا؛ چەق پێ بەستن.
(٢) بیروهۆشی خۆ خستنە سەر (باسێك، ڕووداوێك یا بیروباوەڕێك).
(٣) توندکردنەوە؛ خەست کردنەوە؛ بەهێزکردن.
(٤) کۆکردنەوەی لەشکر لەیەك شوێندا
***v.i.*** (١) چەق بەستن؛ کۆبوونەوە لە ناوجەرگەدا؛ کۆمەڵ بوون لە ناوەڕاستدا.
(٢) ( on : ~ upon ~ ). بیروهۆشی خۆ خستنە سەر.
(٣) توندبوونەوە؛ خەست بوونەوە؛ بەهێزبوون.
***n.*** شتێکی خەست یا توندبووەوە (خواردەمەنی).
***adj.*** خەست
**-concentrator** ***(n.).***
**concentration** (kon′s′n-trā′shən, kon′sen-trā′shən), ***n.*** (١) چەق بەستن؛ کۆبوونەوە لە ناوچەقدا؛ گردبوونەوە لە ناوەڕاستدا.
(٢) بیروهۆش خستنە سەر (٣) خەستی (خواردنەوە).
**concentration camp,** ئۆردووگای زۆرەملێ؛ گرتووخانە- (بۆ دەستبەسەرانی جەنگ و گیراوانی دژی ڕژێم).
**concentric** (kən-sen′trik), ***adj.*** هاوچەق (بازنە):
***( a ~ circles)***
**-concentrically** ***(adv.)***; **concentricity** ***(n.).***
**concept** (kon′sept), ***n.*** بیرێکی گشتی یا بڵاو؛ بیر.
**conception** (kən-sep′shən), ***n.*** (١) سکپڕبوون؛ سکپڕی؛ دروستبوونی ئاوڵەمە. (٢) ئاوڵەمە. (٣) سەرەتا (کار، ڕووداو... هتد).
(٤) بیر؛ بیرێکی گشتی. (٥) بیر یا نەخشەیەکی ڕەسەن.
(٦) هێزو توانای بیرکردنەوە و پێکەوەنان.
**conceptive** (kən-sep′tiv), ***adj.*** توانای بیرکردنەوە و پێکەوەنانی هەیە.
**conceptual** (kən-sep′choo-əl), ***adj.*** تایبەتی بە بیرو بیرکردنەوەو پێکەوەنان.
**conceptualism** (kən-sep′choo-əl-iz′m), ***n.*** ڕێبازێکی فەلسەفی‌یە دەڵێت: کە بیری گشتی هیچ ڕاستی‌یەکی نی‌یە تەنها لە مێشکدا نەبێت.
**-conceptualist** ***(n. & adj.).***
**concern** (kən-sũrn′), ***v.t.*** (١) پەیوەندی پێوەبوون؛ لەلا گرنگ بوون؛ بەتەنگەوەهاتن؛ تایبەتی بوون بە: ***( The subject ~s all of us.)***.
(٢) پێوە خەریك بوون: ***( He ~s himself with trivia.)***.
(٣) تووشی خەم و مەراق کردن.
***n.*** (١) شتێك کە بەتەنگیەوە بێیت؛ شتێك کە لەلات گرنگ بێت.
(٢) بەتەنگەوەهاتن؛ دڵسۆزی: ***( ~ for his well-being)***.
(٣) پەیوەندی. (٤) مەراق؛ خەم.
(٥) کۆمپانیا؛ دەزگایەکی بازرگانی یا کاروبار.
**as concerns,** سەبارەت بە؛ دەربارەی؛ لە بابەت.
**concerned** (kən-sũrnd′), ***adj.*** بەتەنگەوەهاتوو؛ دڵسۆز؛ بەپەروا؛ خەمخۆر.
**concerning** (kən-sũrn′iŋ), ***prep.*** دەربارەی؛ سەبارەت بە.
**concernment** (kən-sũrn′mənt), ***n.*** (١) کاروبار؛ بەرژەوەندی.
(٢) پەیوەندی؛ گرنگی؛ بایەخ. (٣) خەریك بوون. (٤) خەم؛ مەراق.
**concert** (kən-sũrt′), ***v.t. & v.i.*** پێکەوە کارکردن؛ بە ڕێکەوتن و هاوکاری هەردوولا کارکردن و بڕیاردان؛ پێکەوە نەخشەدانان؛ یەکخستن
***n.*** (١) ڕێکەوتن؛ هاوکاری کردن؛ پێکەوە گونجان.
(٢) گونجانی ئاواز؛ پێکەوە گونجان. (٣) ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی.
***adj.*** تایبەتی بە ئاهەنگی مۆسیقا و گۆرانی.
**in concert,** پێکەوە؛ هەموو لەگەڵ یەك؛ لەگەڵ.
**concerted** (kən-sũr′tid), ***adj.*** (١) پێکەوەکراو؛ یەکخراو؛ یەکگرتوو؛ پێکەوە نەخشەکراو و جێبەجێکراو؛ گشتی؛ کۆ:
***( They made a ~ effort to help him.)***
(٢) بەگوێرەی دەنگ و ئامێری مۆسیقا ڕێکخراوە (مۆسیقا).
**concertina** (kon′sẽr-tē′nə), ***n.*** ئامێرێکی مۆسیقایی وەك ئۆکۆردیۆنە.
**concertmaster** (kon′sẽrt′mas′tẽr, kon′sẽrt′mäs′tẽr), ***n.*** یاریدەدەری سەرۆکی ئۆرکێسترا.
**concertmeister** (kon′sẽrt′mīs′tẽr), ***n.*** = **concertmaster.**
**concerto** (kən-cher′tō), ***n.*** کۆنچێرتۆ: ئاوازێکی مۆسیقایە کە بە یەك ئامێر یا زیاتر بە جیا جیا لێ دەدرێت، واتە بەتەنها لەگەڵ ئۆرکێسترادا.
**concession** (kən-sesh′ən), ***n.*** (١) دان پیانان؛ بەدەستەوەدان؛ دان نان بە سەرکەوتنی بەرامبەردا؛ وازهێنان لە ماف؛ پێ لە ڕاستی‌یەك یا ڕووداوێك نان. (٢) شتێك یا ڕووداوێك کە دانی پیابنرێت؛ مافێکی وازلێهێنراو؛ مافێکی دراو بە بەرامبەر یا بە دوژمن. (٣) مافێکی تایبەتی کە لەلایەن فەرمانڕەوایی یا کۆمپانی‌یەکەوە درابێت، بەتایبەتی: (ا) مافی بەکارهێنانی

زەوی‌و هەروەها شتی ژێرزەوی وەك نەوت‌و كانزای تر.
(ب) مافی خواردن‌و خواردنەوە فرۆشتن لە باخچەیەكی گشتی یا شوێنی جەماوەریی تردا. (٤) ئەو زەوی‌و جێگەو مافە تایبەتی‌یەی بەم شێوەیە دراوە.

**concessionaire** (kən-sesh´ən-âr′), *n.* خاوەن مافێكی تایبەتی پێدراو (مانای سێیەمی ووشەی پێشوو ببینە).

**concessionary** (kən-sesh′ən-er´i), *adj.* تایبەتی‌یە بە پێدانی مافی تایبەتی یا دان نان بە مافێكدا.

*n.* = concessionaire.

**concessioner** (kən-sesh′ən-ēr), *n.* = concessionaire.

**concessive** (kən-ses′iv), *adj.* (١) تایبەتی بە وازهێنەر لە مافی خۆ یا پێدانی مافێكی تایبەتی. (٢) ڕستەیەك كە ئامرازی دان پیانانی تێدابێت (وەك **though, although, even though**) (ڕێزمان).

**conch** (koŋk, konch), *n.* (١) گوێچكەماسی (بەتایبەتی یەكێكی لوول خواردووی گەورە). (٢) بۆشایی گوێ؛ گوێی دەرەوە.

**concha** (koŋ′kə), *n.* (١) ئەندامێك كە لە گوێچكەماسی بچێت وەك ئێسقانی ناو لووت. بۆشایی ناو گوێ‌و گوێی دەرەوە.
(٢) گومەزێكی نیمچە بازنەیی.

**conchiferous** (koŋ-kif′ēr-əs), *adj.* گوێچكەماسیدار.

**conchology** (koŋ-kol′ə-ji), *n.* زانستی گیانداری گوێچكەماسیدارو گوێچكەماسی (زیندەوەرزانی).

**-conchologist** *(n.)*.

**concierge** (kon´si-ûrzh′), *n.* (١) دەرگاوان
(٢) بەردەست؛ ڕاگرتە (ناومال)؛ كارگوزار.

**conciliate** (kən-sil′i-āt´), *v.t.* (١) دل ڕاگرتن؛ دلنەرم كردن؛ دلنەوایی كردن؛ ئاشتكردنەوە؛ ڕازی كردن.
(٢) ڕاكێشانی دلی كەسێك بە چاكەكردن لەگەلیدا.

**-conciliation** *(n.)*; **conciliator** *(n.)*; **conciliatory** *(adj.)*.

**concinnity** (kən-sin′ə-ti), *n.* لەگەل یەكدا گونجاو و جوان (وێژە).

**concise** (kən-sīs′), *adj.* كورت (نووسراو)؛ كورت‌و پڕمانا.

**-concisely** *(adv.)*; **conciseness** *(n.)*.

**concision** (kən-sizh′ən), *n.* (١) كورتی‌و پڕمانایی (نووسراو).
(٢) [Archaic]، جیابوونەوە؛ بەش بەش بوون (كۆمەل یا ڕێكخراو).

**conclave** (kon′klāv, koŋ′klāv), *n.* (١) كۆبوونەوەیەكی نهێنی؛ كۆڕێكی تایبەتی. (٢) كۆڕی نهێنی كەلەقەشەكان بۆ هەلبژاردنی پاپا.

**conclude** (kən-klōōd′, kən-klūd′), *v.t.* (١) كۆتایی پێ هێنان (كۆبوونەوە). (٢) گەیشتنە ئەنجام؛ وابۆدەركەوتن؛ دۆزینەوە. (٣) بڕیاردان.
(٤) بڕینەوە (ڕێكەوتن)؛ بەستن (پەیمان)؛ ڕێكەوتن لەسەر:
*( The two sides ~d a treaty.)*

*v.i.* (١) كۆتایی هاتن؛ تەواوبوون (كۆبوونەوە). (٢) ڕێكەوتن.

**conclusion** (kən-klōō′zhən, kən-klū′zhən), *n.* (١) كۆتایی؛ دوایی؛ پایان. (٢) دوا ووتە؛ دوا بەشی ووتار یا گفتوگۆیەك (كە گەلێك جار پوختەی هەموو ووتارەكەی تێدایە). (٣) ئەنجام.
(٤) بڕیارێك (لەئەنجامی گفتوگۆدا). (٥) بڕینەوە (ڕێكەوتن)؛ بەستن (پەیمان).

**in conclusion,** لەئەنجامدا؛ لە كۆتاییدا؛ لە دوا ووتەدا.

**try conclusions with,** بەشداربوون لە مشت‌ومڕ، ملەملێ؛ یا پێشبڕكێ‌یەكدا.

**conclusive** (kən-klōō′siv, kən-klū′siv), *adj.* یەكلاكەرەوە (بەلگە)؛ بڕیاردەر (بەلگە)؛ دوایی پێ هێنەر (بەلگە، ووتە):
*( The evidence against him is ~ .)*

**concoct** (kon-kokt′, kən-kokt′), *v.t.* (١) تێكەلاوكردن (كەرەسە)؛ پێكهێنان؛ ئامادەكردن بە تێكەلاوكردنی چەند كەرەسەیەك (خواردەمەنی)؛ گرتنەوە (دەرمان). (٢) نەخشەكێشان؛ ڕێكخستن (درۆ)؛ هەلبەستن (حیكایەت، درۆ)؛ پێكەوەنان یا ڕێكخستن (پیلان).

**concoction** (kon-kok′shən, kən-kok′shən), *n.* (١) ڕێكخستن؛ پێكهێنان؛ ئامادەكردن؛ هەلبەستن (درۆ). (٢) شتێكی ئاوێتەی پێكهێنراو یا ئامادەكراو (خواردەمەنی)؛ شتێكی هەلبەستراو یا ڕێكخراو (درۆ، پیلان).

**concomitance** (kon-kom′ə-təns, kən-kom′ə-təns), *n.* (١) پێكەوەبوون؛ لەگەلدابوون؛ پێكەوەبوون یا ژیان. (٢) پێكەوەبوونی لەش‌و گیانی مەسیح لە هەموو بەشێكی " شێوی خودایی "دا كە لە كلێسەدا دەكرێت.

**concomitancy** (kon-kom′ə-tən-si, kən-kom′ə-tən-si), *n.* concomitance.

**concomitant** (kon-kom′ə-tənt, kən-kom′ə-tənt), *adj.* لەگەل بوو؛ پێكەوە؛ لەگەل؛ لەگەلێتی‌و لێی نابێتەوە.

*n.* لەگەلدابوو (شت، بارودۆخ).

**concord** (kon′kôrd, koŋ′kôrd), *n.* (١) گونجان؛ تەبایی؛ ڕێكەوتن.
(٢) ئاسایش‌و ئاسوودەیی‌و پەیوەندی باش (لەنێوان دوو وولاتدا).
(٣) پەیمانی برادەرێتی (نێوان دوو وولات).
(٤) لەگەل یەك ڕێكەوتنی ووشەی ڕستەیەك.
(٥) لەگەل یەك سازان (ئاوازی مۆسیقا).

**concordance** (kon-kôr′d'ns, kən-kôr′d'ns), *n.* (١) گونجان؛ ڕێكەوتن؛ سازان؛ پێكهاتن. (٢) پێڕستێكی ئەلفبایی.

**concordant** (kon-kôr′d'nt, kən-kôr′d'nt), *adj.* گونجاو؛ لەگەل یەك ڕێكەوتوو؛ پێكەوە شیاو.

**concordat** (kon-kôr′dat), *n.* (١) پەیمان.
(٢) پەیمانێك كە پاپا دەیبەستێت لەگەل فەرمانڕەوایی‌یەكدا دەربارەی كاروباری كلێسە.

**concourse** (kon′kôrs, koŋ′kōrs), *n.* (١) بەیەكگەیشتن (دوو ڕووبار)؛ لەیەكدان. (٢) جەماوەر. (٣) شوێنی كۆبوونەوەی جەماوەر.
(٤) شوێنێكی كراوە (لە باخچەی گشتی یا ئێستگەی شەمەندەفەردا).
(٥) شەقامێكی پان.

**concrescence** (kon-kres′'ns), *n.* لەیەكدان‌و بوون بە یەك پارچە (ڕووەكناسی)؛ بوون بەیەكی شانەی ڕووەك.

**concrete** (kon-krēt′, kon′krēt), *adj.* (١) ڕەق.
(٢) دیار؛ بەرجەستە؛ هەستپێكراو؛ بە چاو بینراو. (٣) تایبەتی.
(٤) كۆنكریتی؛ لە كۆنكریت دروستكراو.
(٥) ناوی شتێك كە بە چاو ببینرێ‌و هەستی پێ بكرێت (ڕێزمان).

*n.* (١) شتێكی كۆنكریتی. (٢) كۆنكریت.

*v.t.* (١) پتەوكردن؛ ڕەق كردن. (٢) بە كۆنكریت دروستكردن.

*v.i.* ڕەق بوون؛ پتەوبوون؛ یەككگرتن.

**concretion** (kon-krē′shən), *n.* (١) بوون بە یەك؛ ڕەق بوون؛ پتەوبوون. (٢) تۆپەلێكی بەردین؛ تۆپەلێكی ڕەق.
(٣) تۆپەلە كانزای ناو بەردی لمین (زەوی ناسی).
(٤) بەرد یا تۆپەلە بەردی ناو میزەلدان.
(٥) پێكەوەنووسانی پەنجەی دەست یا پێ.

**concretize** (kon′kri-tīz´), *v.t.* تایبەتی كردن.

**concubinage** (kon-kū′bə-nij), *n.* (١) ژیانی پیاوێك‌و دۆستەكەی پێكەوە بەبێ مارەكردن؛ هاوسەرێتی پیاوێك‌و دۆستەكەی بەبێ مارەكردن.
(٢) باری دۆست (ژن)؛ باری ژیانی دۆست.

**concubine** (koŋ′kyoo-bīn´, kon′kyoo-bīn´), *n.* (١) دۆست (ژن)؛ ژنێك كە لەگەل پیاوێكدا دەژی بەبێ مارەكردن.
(٢) ژنی دووەم: لە كۆمەلگایەكدا كە فرە ژنداریی تێدابێت.

**concupiscence** (kon-kū′pə-s'ns), *n.* حەزكردنێكی لە ئەندازە بەدەری جووت بوون؛ هەوەسی بەتینی جووت بوون؛ زۆر ئارەزووی گان.

**concupiscent** (kon-kū′pə-s'nt), *adj.* حەشەری؛ زۆر حەزكەر لە جووت بوون؛ بەهەوەس (جووت بوون).

**concur** (kən-kūr′), *v.i.* (١) ڕێكەوتن (كاتی ڕوودان)؛ هاوكات.
(٢) هاوكاری كردن؛ یەككگرتن:
*( Several circumstances ~red to bring about this result.)*
(٣) لەگەلدابوون (ڕا)؛ ڕا لەسەربوون؛ ڕێكەوتن (ڕا)؛ پێكهاتن.

**concurrence** (kən-kūr′əns), *n.* (١) ڕێكەوتن (كات یا شوێنی

ڕوودان). (٢) هاوكاری؛ یەكگرتن. (٣) پێكهاتن؛ ڕێكەوتن.
(٤) خاڵی بەیەكگەیشتنی چەند هێڵێك. (٥) ماف یا دارایەكی هاوبەشی.

**concurrent** (kən-kŭr′ənt), *adj.* (١) لە هەمان كات یا شوێندا ڕوودراو. (٢) پێكەوە كاركەر؛ هاوكاریكەر؛ لەگەڵدا كاركەر.
(٣) بەیەكگەیشتن؛ بەرەو هەمان شوێن چوو. (٤) ڕێكەوتوو؛ یەككگرتوو.
(٥) هاوبەشی دەسەڵات و ماف.
*n.* (١) شتێكی لەگەڵدا گونجاو یا هاوئەنجام. (٢) [Rare]، هاوچاو.

**concurrently** (kən-kŭr′ənt-li), *adv.* لە هەمان كاتدا؛ پێكەوە؛ لەگەڵ.

**concurrent resolution,** بڕیاری یەكێك لە بەشەكانی پەرلەمان كە بەشی دووەمیش پەسەند بكات (ئەم جۆرە بڕیارە هێزی یاسایی نییە).

**concussion** (kən-kush′ən), *n.* (١) ڕاوەشان؛ ڕاتەكان؛ خورپە.
(٢) ڕاوەشان و زیان پێ گەیاندنی مێشك و كەمكردنەوەی هۆشیاری لەئەنجامی لێدان، پیادان یا كەوتنێكدا.

**condemn** (kən-dem′), *v.t.* (١) نارەزایی دەربڕین؛ سەرزەنشت كردن.
(٢) تاوانباركردن؛ گوناهباركردن.
(٣) سزا بەسەرداداڵن: *( He was ~ed to death.)* .
(٤) دەست بەسەرداگرتنی زەوی‌وزار بۆ بەكارهێنانی گشتی.
(٥) بڕیاری چۆڵ كردن یا ڕووخاندنی دان لەبەر پەڕپووتی (خانوو):
*( The old house was ~ed by the housing authorities.)*
(٦) بڕیاردانی چارەسەرنەبوونی نەخۆشێك.

**condemnable** (kən-dem′nə-b'l), *adj.* شایستەی تاوانباركردنە؛ شایستەی سەرزەنشتە؛ گوناهبارە؛ لۆمە دەكرێ.

**condemnation** (kon′dem-nā′shən), *n.* (١) تاوانباركردن
(٢) سەرزەنشت؛ سەرزەنشت كردن.
(٣) هۆی تاوانباركردن یا سەرزەنشت كردن.

**-condemnatory** *(adj.).*

**condensable** (kən-den′sə-b'l), *adj.* (١) خەست دەكرێتەوە؛ خەست دەبێتەوە (٢) كورت دەكرێتەوە (پەخشان).

**condensate** (kən-den′sāt), *v.t. & v.i.* [Rare], (١) خەست - كردنەوە (٢) كورتكردنەوە.
*adj.* (١) خەستكراوە (٢) كورتكراوە.
*n.* (١) شتێكی خەستكراوە. (٢) شتێكی كورتكراوە.

**condensation** (kon′den-sā′shən), *n.* (١) خەستكردنەوە؛ خەستی؛ چڕی؛ تۆپەڵ كردن؛ تۆپەڵ بوون.
(٢) كورتكردنەوە (پەخشان، وێژە)؛ كورتی.
(٣) شتێكی خەستكراوە؛ شتێكی خەست؛ تۆپەڵ.
(٤) شتێكی كورتكراوە (پەخشان، وێژە)؛ پارچە نووسراوێكی كورتكراوە.

**condense** (kən-dens′), *v.t.* (١) خەستكردنەوە؛ توندكردنەوە؛ پەستنەوە؛ تۆپەڵ كردن. (٢) كورتكردنەوە (پەخشان، وێژە، هەڵبەست).
(٣) بەتین كردن؛ بەتینتركردن (تیشكی ڕووناكی)
(٤) گۆڕینی شێوەی شتێك بە خەستكردنەوە (وەك لە هەڵم یا گازەوە بۆ شلە).
*v.i.* (١) خەستبوونەوە؛ توندبوونەوە؛ تۆپەڵ بوون؛ پەستنەوە.
(٢) گۆڕانی شتێك بۆ شتێكی تر بەهۆی خەستبوونەوەیەوە (هەڵم و گاز بۆ شلە).

**condensed milk,** شیری قوتوو. شیری خەستكراوەی شەكر تێكراو.

**condenser** (kən-den′sẽr), *n.* (١) خەستكەرەوە؛ كۆكەرەوە.
(٢) ئامێری گۆڕینی هەڵم بۆ شلە. (٣) ئامێری كۆكەرەوەی تەوژمی كارەبا ,مەكینەی ئوتومبیل). (٤) ڕووناكی یا تیشك كۆكەرەوە (ئاوێنە).

**condensible** (kən-den′sə-b'l), *adj.* = **condensable.**

**condescend** (kon′di-send′), *v.i.* (١) بەفیزەوە لەگەڵ جووڵانەوە؛ خۆ هێنانە خوارەوە بۆ پلەی كەسانێك كە نزمترین یان بە نزمتریان دانێیت لە خۆت و هەندێ جار بە جوانی و هەندێ جار بەفیزەوە جووڵانەوە لەگەڵیاندا؛ بە سووكی تەماشاكردنی خەڵك؛ بە جوانی لەگەڵ خەڵكدا جووڵانەوە بەڵام بەفیزەوەو بەشێوەیەك كە پیشانی بدەیت كە تۆ لەوان باشتریت بەڵام هێشتا بێزت دێت لەگەڵیان هەڵسوكەوت بكەیت. (٢) [Obs.]، قایل بوون؛ ڕێكەوتن.

**condescendence** (kon′di-sen′dəns), *n.* (١) بە جوانی لەگەڵ خەڵكدا جووڵانەوە بەڵام بەفیزەوەو بەشێوەیەك كە پیشانی بدەیت كە تۆ لەوان باشتریت بەڵام بێزت دێت هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكەیت؛ بە سووك تەماشاكردن.
(٢) [Scot.]، لیستەی سكاڵاكانی داواچی (دادگا).

**condescending** (kon′di-sen′diŋ), *adj.* بە جوانی لەگەڵ خەڵكدا دەجووڵێتەوە بەڵام بەفیزەوەو بەشێوەیەك كە پیشانی بدات كە ئەو لەوان باشترە بەڵام بێزی دێت هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكات؛ بە سووك تەماشاكردن.

**-condescendingly** *(adv.).*

**condescension** (kon′di-sen′shən), *n.* بە جوانی لەگەڵ خەڵكدا جووڵانەوە بەڵام بەفیزەوەو بەشێوەیەك كە پیشانی بدەیت كە تۆ لەوان باشتریت بەڵام بێزت دێت هەڵسوكەوتیان لەگەڵ بكەیت؛ بە سووك سەیركردن.

**condign** (kən-dīn′), *adj.* ڕەوا (سزا)؛ لە جێی خۆیدایە (سزا)؛ هەڵدەگرێت.

**condiment** (kon′də-mənt), *n.* بەهارات.

**condition** (kən-dish′ən), *n.* (١) مەرج:
*( Ability is one of the ~s of success.)*
(٢) دۆخ (مرۆڤ، شت).
(٣) باری تەندرووستی؛ تەندرووست؛ ئامادە (تەندرووستی):
*( He is in ~ . ; Your horse seems to be in good ~ .)*
(٤) [Colloq.]، نەخۆشی: *( He has a heart ~ .)* .
(٥) پلەی كۆمەڵایەتی: *( a person of high ~ )* .
(٦) *(pl.)*، بارودۆخ؛ چۆنێتی:
*( good economic ~ ; poor driving ~ )*
(٧) بەشی مەرج دەربڕ لە ڕستەیەكی مەرجیدا كە بە " if " یان " unless " دەست پێ دەكات (ڕێزمان):
*( If I get enough money, I will by a car.)*
(٨) نمرەی خراپ دان بە قوتابییەك و دانانی پڕكردنەوەی نمرەكە بە مەرجێك بۆ مانەوەی لە هەمان پۆلدا؛ نمرەیەكی وەها خراپ.
*v.t.* (١) مەرج دانان؛ كردن بە مەرج.
(٢) تەندرووست كردن؛ باش و بەهێزكردن: *( Exercise ~s your body.)*
(٣) داواكردن لە قوتابییەك كە نمرە خراپەكەی بەرز بكاتەوە بۆنەوەی دەرچێت.
(٤) ڕاهێنان؛ فێركردن (دەروونناسی)؛ بڕیاردانی چۆنێتی ڕەووشتی مرۆڤ و گیاندار: *( Society ~s us to behave in a certain way.)* .
(٥) بڕیاردان: *( Our income ~s what we spend.)* .
*v.i.* مەرج دانان.
in condition, تەندرووستی باش بوون؛ لە تەندرووستیدا بوون.
in no condition to, تەندرووستی ئەوە هەڵناگرێ؛ لە تواناذا نەبوون:
*( He is in no condition to travel.)*
on condition that, بە مەرجێك؛ ئەگەر.
out of condition, تەندرووستی باش نەبوون (بەهۆی وەرزش نەكردن و نەجووڵانەوە):
*( I haven't exercised lately, so I am ou of condition.)*

**conditional** (kən-dish′ən-'l), *adj.* (١) بە مەرج؛ مەرجی تێدایە؛ مەرجی لەسەر دانراوە؛ بە مەرجەوە دراو یا كراو: *( ~ aid)* .
(٢) مسۆگەر نییە. (٣) مەرجی (ڕێزمان): *( a ~ clause)* .

**conditionally** (kən-dish′ən-'l-i), *adv.* بەمەرجەوە.

**conditioned** (kən-dish′ənd), *adj.* (١) لە بار یا دۆخێكی تایبەتیدایە. (٢) بەمەرجە؛ دەكەوێتە سەر مەرجێك یا زیاتر.
(٣) لە دۆخێكی باشدایە؛ تەندرووستی باشە؛ ئامادەیە.
(٤) ڕاهاتووە (دەروونناسی)؛ فێربووە.

**conditioner** (kən-dish′ən-ẽr), *n.* (١) گونجێنەر؛ فێنككەرەوە:
*( air- ~ )*
(٢) (ا) ماددەیەكە كە چۆنێتی شتێك باشتر دەكات: *( a soil ~ )* .
(ب) دەرمانی قژ چاكردن: *( a hair ~ )* .
(٣) ڕاهێنەری وەرزشی.

**condole** (kən-dōl′), *v.i.* سەرخۆشی لێکردن؛ هاوسۆزی لەگەڵ کردن لە مردنی خزمێکدا.

**condolence** (kən-dō′ləns), *n.* پرسەنامە؛ سەرخۆشی لێکردن؛ سەرخۆشی.

**condom** (kon′dəm, kun′dəm), *n.* لاستیك (بۆ جووت بوون).

**condominium** (kon′də-min′i-əm), *n.* (١) (ا) هاوبەشی کردن لە حوکمرانی ناوچەیەکدا لەلایەن دوو وڵات یا زیاترەوە. (ب) ناوچەیەك کە وەها حوکمڕانی بکرێت. (٢) (ا) خانوویەکی گەورەی بەش بەش کە هەر بەشێکی هی کەسێك بێت. (ب) بەشێك لە خانوویەکی گەورەی وەها.

**condonation** (kon′dō-nā′shən), *n.* (١) لێبووردن؛ لێ خۆش بوون. (٢) لێبووردنی مێردێك یا ژنەکەی لە داوێن پیسی ئەوی تریان (دادگا).

**condone** (kən-dōn′), *v.t.* لێبووردن؛ لێ خۆش بوون؛ چاو لێ پۆشین؛ پەسەندکردن: ***( You shouldn't ~ criminal acts.)*** .

**condor** (kon′dēr), *n.* (١) سیسارکی ئەمەریکی گەورە. (٢) پارەیەکی ئاڵتوونە وێنەی سیسارکی لەسەرە لە هەندێك وڵاتانی ئەمەریکای باشوور.

**conduce** (kən-dōōs′, kən-dūs′), *v.i.* ( ~ to; ~ toward ), وا- لێکردن؛ هاندان؛ یارمەتی ڕوودانی شتێك دەدات.

**conducive** (kən-dōō′siv, kən-dū′siv), *adj.* ( ~ to ), هاندەر؛ یارمەتیدەر؛ بوون بە هۆی: ***( Fresh air is ~ to health.; Noise is not ~ to study.)***

**conduct** (kon′dukt), *n.* (١) ڕابەری. (٢) بەڕێوەبردن؛ کردن. (٣) ڕەوشت؛ ڕەفتار. (٤) [Obs.]، ڕابەر؛ چاوساغ.

*v.t.* (١) ڕابەری کردن؛ ڕێ پیشاندان؛ بردن بۆ شوێنێك. (٢) بەڕێوەبردن؛ ئاراستەکردن. (٣) ڕابەری کردنی ئۆرکێسترا: ***( to ~ an orchestra)*** . (٤) هەڵسان و دانیشتن؛ ڕەفتارکردن: ***( She always ~s herself well in public.)*** (٥) گەیاندن (کارەبا، گەرما): ***( The wire ~s electricity.)*** .

*v.i.* (١) ڕابەری کردن؛ ڕێ پیشاندان. (٢) سەرکردەیی کردنی ئۆرکێسترا.

**conductance** (kən-duk′təns), *n.* توانای ماددەیەك بۆ گەیاندنی کارەبا؛ گەیاندن (کارەبا).

**conductible** (kən-duk′tə-b'l), *adj.* (١) دەگەیەنرێت (کارەبا)؛ گەیەنەر. (٢) دەتوانێت بگەیەنێت (کارەبا).

**conduction** (kən-duk′shən), *n.* (١) گەیاندن (ئاو بە جۆگەیەکدا). (٢) (ا) گەیاندن (کارەبا، گەرما... هتد). (ب) توانای گەیاندن بوون.

**conductive** (kən-duk′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە توانای گەیاندن. (٢) تایبەتی بە گەیاندن (کارەبا، گەرما، ئاو... هتد).

**conductor** (kən-duk′tēr), *n.* (١) ڕابەر؛ چاوساغ؛ ڕێ پیشاندەر. (٢) ڕابەری ئۆرکێسترا یا تیپی مۆسیقا. (٣) بلیتبڕ و وەرگر (شەمەندەفەر، پاس... هتد)؛ باجگر (شەمەندەفەر، پاس). (٤) گەیەنەر (کارەبا، گەرمی... هتد)؛ کارەبابەر

**-conductorship** *(n.).*

**conduit** (kon′dit, kon′doo-it), *n.* (١) جۆگە؛ بۆری. (٢) بۆری پاراستنی تەلی کارەبا. (٣) [Archaic]، کانی؛ کانیاو.

**conduplicate** (kon-dōō′plə-kit, kon-dū′plə-kit), *adj.* لە باری درێژی و لە ناوەڕاستدا دانوشتاو (گەڵا، پەڕەی خونچە).

**condyle** (kon′dil), *n.* ئێسقانی دەرپۆقیو.

**-condylar** *(adj.)*; **condyloid** *(adj.).*

**condyloma** (kon′di-lō′mə), *n.* زیادە گۆشتێکی وەك مێخەکە وایە لەدەوری کۆم و کۆئەندامی جووت بوون دێت (بەتایبەتی بەهۆی فەرەنگی، یا ئاتەشەکەوە).

**cone** (kōn), *n.* (١) قووچەك (ئەندازە). (٢) شتێك کە وەك قووچەك وابێت، وەك: (ا) قووچەکێکی لە بسکویت دروستکراوە دوندرمەی تێ دەکرێت و دەیشخورێت. (ب) پۆپەی ئاگرپژێن. (٣) بەری دارێکی هەمیشە سەوز (لە قووچەك دەچێت).

*v.t.* وەك قووچەك لێکردن؛ وەك قووچەك دروستکردن.

**coneflower** (kōn′flou′ēr), *n.* ڕووەکێکە گوڵی قووچەك ئاسایی دەگرێت.

**coney** (kō′ni, kun′i), *n.* = **cony.**

**confab** (kon′fab), *n.* [Colloq.], دەمەتەقێ؛ وتووێژ؛ دووان.

**confabulate** (kən-fab′yoo-lāt′), *v.i.* دەمەتەقێ کردن؛ دووانن؛ وتوویژکردن.

**confabulation** (kən-fab′yoo-lā′shən), *n.* دەمەتەقێ؛ دووان؛ وتوویژ.

**confect** (kən-fekt′), *v.t.* (١) تێکەڵاوکردن؛ گرتنەوە. (٢) مرەبا دروستکردن. (٣) کردن؛ دروستکردن.

**confection** (kən-fek′shən), *n.* (١) تێکەڵاوکردن؛ دروستکردن؛ گرتنەوە. (٢) نوقوڵ؛ شیرینی؛ حەڵوا. (٣) دەرمانێکی شیرین کراوە بە شەکر یا هەنگوین. (٤) پارچە جلێکی نایابی ژنانە.

*v.t.* کردن بە نوقوڵ؛ شیرینی دروستکردن.

**confectionary** (kən-fek′shən-er′i), *adj.* (١) تایبەتی بە نوقوڵ و شیرینی تر و دروستکردنیان. (٢) تایبەتی بە حەڵواچی یا کارەکەی.

*n.* (١) دووکانی حەڵواچی؛ حەڵواخانە. (٢) حەڵوا؛ نوقوڵ؛ شیرینی.

**confectioner** (kən-fek′shən-ēr), *n.* حەڵواچی؛ شیرینی فرۆش.

**confectioners' sugar,** شەکری حەڵواچی: شەکری زۆر ورد.

**confectionery** (kən-fek′shən-er′i), *n.* (١) حەڵوا؛ شیرینی؛ نوقوڵ و جیکلاتە و شیرینی تر. (٢) حەڵواچێتی. (٣) دووکانی حەڵواچی؛ حەڵواخانە.

**confederacy** (kən-fed′ēr-ə-si), *n.* (١) پەیمان (لەنێوان چەند وڵات، حیزب، یا کۆمەڵێکدا). (٢) هاوپەیمانی؛ یەکێتی. (٣) پیلان؛ پیلانکاری قەدەغە.

**the Confederacy,** ئەو یانگزە ویلایەتەی باشووری ئەمەریکا کە لە ساڵی ١٨٦٠–١٨٦١ دا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جیابوونەوە. وە ئەم جیابوونەوەیە بوو بەهۆی ڕوودانی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا.

**confederate** (kən-fed′ēr-it), *adj.* (١) یەکگرتوو؛ هاوپەیمان. (٢) [C-]، تایبەتی بەو ویلایەتانەی لە ئەمەریکا جیابوونەوە (ووشەی پێشوو).

*n.* (١) هاوپەیمان (مرۆڤ، کۆمەڵ، وڵات). (٢) هاوبەشی پیلان (کاری قەدەغە). (٣) [C-]، یەکێك لەو یانگزە ویلایەتەی باشوور کە لە ئەمەریکا جیابوونەوە.

*v.t. & v.i.* یەکگرتن؛ بوون بە یەك؛ پەیمان بەستن.

**confederation** (kən-fed′ēr-ā′shən), *n.* (١) یەکێتی؛ هاوپەیمانی. (٢) یەکێتی چەند وڵاتێك؛ بوون بە یەك (چەند وڵاتێك).

**the Confederation,** یەکێتی یا بوون بە یەکی ویلایەتەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ١٧٨١–١٧٨٩ .

**confer** (kən-fũr′), *v.t.* پێ بەخشین (بڕوانامە، ڕێزێکی تایبەتی)؛ پێدان: ***( The university ~red an honorary degree on him.)*** .

*v.i.* ڕاوێژکردن؛ گفتوگۆکردن؛ دووان؛ کۆنگرە بەستن؛ پرس پێکردن.

**confer** (kən-fũr′), *v.t.* بەراووردکردن؛ ڕوانینە سەرچاوەیەکی تر بۆ بەراووردکردن (لێکۆڵینەوە) (کورتەکەی .cf یان .conf ) .

**-conferment** *(n.).*

**conferee** (kon′fēr-ē′), *n.* (١) بەشداری کۆنگرە؛ بەشداری کۆڕ؛ کۆڕگر؛ ڕاوێژکەر. (٢) پێ بەخشراوی بڕوانامە، ماف، یا ڕێزێکی تایبەتی.

**conference** (kon′fēr-əns), *n.* (١) ڕاوێژ؛ ڕاوێژکردن؛ گفتوگۆ. (٢) کۆنفرانس؛ کۆڕ؛ کۆنگرە. (٣) کۆبوونەوە یا کۆنگرەی دوو لیژنە یا زیاتری هەردوو ئەنجوومەنی پەرلەمان بۆ پێکهاتن لەسەر جیاوازی گەڵاڵەی ئەو یاسایانەی هەردوو لقی پەرلەمان پەسەندیان کردووە. (٤) یەکێتی چەند کڵێسە، قوتابخانە، یا تیپی وەرزشی.

**-conferential** *(adj.).*

**conferva** (kən-fũr′və), *n.* جۆرە قەوزەیەکە؛ قەوزە.

**confess** (kən-fes′), *v.t.* (١) دان پیانان (کەموکووڕی، تاوان، ڕا)؛
پێ‌لێنان؛ چوونەژێر. (٢) دان پیانان (ڕاستی‌یەك).
(٣) ئاشکراکردنی بڕواکردن بە بیروباوەڕێك.
(٤) (ا) پاکانەکردن بۆ قەشە بۆ خۆش بوون لە تاوانی پاکانەکەر.
(ب) گوێگرتن لە پاکانەیەکی وەها لەلایەن قەشەوە.
*v.i.* (١) دان پیانان (تاوان، کەموکووڕی)؛ چوونەژێر.
(٢) (ا) پاکانەکردن لەبەردەمی قەشەدا.
(ب) گوێگرتنی قەشە لە پاکانەیەکی وەها.
**confess to,** دان پیانان؛ پێ‌لێنان.
**confession** (kən-fesh′ən), *n.* (١) دان پیانان؛ پێ‌لێنان.
(٢) شتێکی دان پیانراو. (٣) چوونەژێر (تاوان)؛ پێ‌لێنان (تاوان، گوناه).
(٤) پاکانە (گوناه و خراپەکاری بۆ قەشە بۆ لێ خۆش بوون‌و سڕینەوەیان).
(٥) بڕوا (ئاین) (٦) تاقمێکی یەك ئاین.
(٧) گۆڕ (کەسێکی ئاینی پیرۆز یا شەهیدێك)؛ نزرگە؛ مەرقەد.
**confessional** (kən-fesh′ən-'l), *n.* (١) ژوورێکی بچووکە لە قوژبنی
کلێسەدا کە تیایدا قەشە گوێ لە پاکانەی گوناهباران دەگرێت.
(٢) پاکانە (گوناه بۆ قەشە)؛ پاکانەکردن.
*adj.* (١) تایبەتی بە پاکانەو پاکانەکردن. (٢) تایبەتی بە بیروباوەڕ (ئاین).
**confessionary** (kən-fesh′ən-er′i), *adj. & n.* [Rare].
**confessional.**
**confessor** (kən-fes′ẽr), *n.* (١) دان پیانەر؛ پێ‌لێنەر؛ پاکانەکەر.
(٢) کەسێکە کە بیروباوەڕی ئاینی خۆی ئاشکرابکات ئەگەرچی ببێت بەهۆی
چەوسانەوەی (٣) قەشەیەك کە گوێ لە پاکانەی گوناهباران دەگرێت‌و لێیان
خۆش دەبێت
**confetti** (kən-fet′i), *n.pl.* (١) نوقوڵ‌و جیکلاتەو شیرینی تر کە لە
ئاهەنگ‌و شاییدا بەناو خەڵکدا بڵاودەکرێتەوە. (٢) پارچە کاغەزی بچووکی
ڕەنگاوڕەنگ کە لە ئاهەنگ‌و شاییدا بەناو خەڵکدا بڵاودەکرێتەوە؛ کاغەزی
ڕازاندنەوەی ڕەنگاوڕەنگ.
**confidant** (kon′fə-dant′), *n.* هاوڕاز؛ ڕازگر؛ ڕازدار؛ کەسێك کە
ڕازونیازی دڵی خۆتی لەلا ئاشکرا بکەیت‌و بیپارێزێت؛ نهێنی پۆش.
**confidante** (kon′fə-dant′), *n.* هاوڕازی مێینە؛ ڕازگری مێینە؛
نهێنی پۆشی مێینە.
**confide** (kən-fīd′), *v.i.* بڕواپێکردن؛ متمانەپێکردن.
*v.t.* (١) پێ ووتن (ڕازونیازی دڵی خۆ):
*( She ~d her difficulties to her friend.)*
(٢) پێ سپاردن (ئەرك، شت، کەس).
**confidence** (kon′fə-dəns), *n.* (١) باوەڕ؛ متمانە؛ پشت ئەستووری.
(٢) دڵنیایی (٣) بڕوا بە خۆ کردن؛ بڕوا بە توانای خۆ بوون.
(٤) کەسێك یا شتێکی پشت پێ بەستراو
(٥) هاوڕازی؛ ڕازگری: *( She took him into her ~ .)*.
(٦) دڵنیایی ڕازپۆشین: *( It was told in strict ~ . )*
(٧) ڕاز؛ نهێنی‌یەك کە بە نهێنی پۆشێك بووترێت
**confidence game,** لەخشتەبردنی کەسێك‌و شت لێسەندنی لەلایەن
ساختەچی‌یەکەوە پاش ئەوەی وا لەو کەسە دەکات بڕوای پێ بکات.
**confidence man,** ساختەچی؛ پیاوێکی ساختەچی کە شت لە خەڵك
دەسێنێت پاش ئەوەی وایان لێدەکات بڕوای پێ بکەن؛ چاوبەست.
**confident** (kon′fə-dənt), *adj.* (١) دڵنیا؛ پشت ئەستوور.
(٢) بڕوا بە خۆ کەر *( a ~ manner)*.
(٣) [Archaic]. خۆش بڕوا.
*n.* هاوڕاز؛ نهێنی پۆش.
**confidential** (kon′fə-den′shəl), *adj.* (١) نهێنی؛ قەدەغە:
*( ~ information)*
(٢) برایانە؛ بڕواپێکەرانە.
(٣) بڕواپێکراو: *( a ~ agent)*.
-**confidentiality** *(n.)*; **confidentially** *(adv.)*.

**confidential communication,** نهێنی‌یەك کە بە پارێزەر،
پزیشك، یا ژن‌و مێردی خۆ دەووترێت‌و ناتوانرێ بەزۆر پێ‌یان ئاشکرا بکرێت
لە دادگا.
**confiding** (kən-fīd′iŋ), *adj.* خۆش باوەڕ؛ بڕواکەر.
**configuration** (kən-fig′yoo-rā′shən), *n.* شێوە؛ وێنە؛ ڕیز-
کردن‌و یەکخستنی هەموو ئەو بەشانەی شتێکیان لێ پێکهاتووە.
**confine** (kon′fīn′), *n.* (١) (*pl.*)، (ا) سنوور؛ ڕادە.
(ب) ناوچەیەکی سنووردار. (٢) [Poetic]، بەندی؛ گیرۆدەیی.
(٣) [Obs.]، بەندیخانە؛ شوێنێکی بێ سەربەستی.
*v.i.* [Rare]. هاوسنووربوون.
*v.t.* (١) سنوور بۆ دانان؛ سنوور بۆ دیاریکردن؛ ئابلۆوقەدان؛ بەستنەوە؛
جڵەوگرتن: *( Please ~ your remarks to the facts.)*.
(٢) بەندکردن؛ قەتیس کردن؛ خستنە بەندیخانەوە؛ گیرۆدەکردن؛ بەستنەوە؛
ڕاگرتن: *( The doctor ~d him to his room.)*.
**be confined,** منداڵبوون.
**confinement** (kən-fīn′mənt), *n.* قەتیس بوون؛ قەتیس کردن؛
بەستانەوە: (ا) لە بەندیخانەدا بوون؛ خستنە بەندیخانەوە.
(ب) بەندێتی؛ سەربەست نەبوون؛ گیرۆدەیی.
(ج) منداڵبوون؛ لە جێگەدا کەوتن (کاتی منداڵبوون).
**confirm** (kən-fũrm′), *v.t.* (١) جێگیرکردن؛ چەسپاندن؛ بەهێزکردن؛
دووپاتکردنەوە؛ پاڵپشتی کردن. (٢) مۆرکردن (پەیمان)؛ پەسەندکردن.
(٣) سەلماندن؛ ساغ کردنەوە؛ چەسپاندن (ڕاستی‌یەك).
(٤) وەرگرتنی کەسێك بە ئەندام لە کلێسەدا پاش دووپاتکردنەوەی ئەو بەڵێنە
ئاینی‌یانەی بە منداڵی دایك‌و باوکی بۆیان داوە.
**confirmation** (kon′fẽr-mā′shən), *n.* (١) چەسپاندن؛
جێگیرکردن؛ جێگیربوون؛ پاڵپشتی کردن. (٢) مۆرکردن؛ پەسەندکردن.
(٣) بەڵگە؛ شتێك کە ڕاستی‌و درۆی ڕووداوێك ساغ دەکاتەوە؛ ساغ کەرەوە.
(٤) وەرگرتنی کەسێك بە ئەندام لە کلێسەدا پاش دووپاتکردنەوەی ئەو بەڵێنە
ئاینی‌یانەی بە منداڵی دایك‌و باوکی بۆیان داوە.
-**confirmative** *(adj.)*; **confirmatory** *(adj.)*.
**confirmed** (kən-fũrmd′), *adj.* (١) مۆرکراو (پەیمان)؛ پەسەندکراو.
(٢) چەسپاو؛ جێگیربوو؛ هەمیشەیی: *( a ~ bachelor)*.
(٣) وەرگیراوە بە ئەندام لە کلێسەدا پاش دووپاتکردنەوەی ئەو بەڵێنە
ئاینی‌یانەی بە منداڵی دایك‌و باوکی بۆیان داوە.
**confiscable** (kən-fis′kə-b'l), *adj.* لەوانەیە دەستی بەسەردا
بگیرێت؛ بۆی هەیە دەستی بەسەردا بگیرێت.
**confiscate** (kon′fis-kāt′), *v.t.* دەست بەسەرداگرتن (خانوو،
زەوی‌وزار، سەرمایە).
*adj.* (١) دەست بەسەرداگیراو.
(٢) خانوو و زەوی‌وزارو سەرمایەکەی دەستی بەسەردا گیراوە.
**confiscation** (kon′fis-kā′shən), *n.* (١) دەست بەسەرداگرتن؛
دەست بەسەرداگیران (خانوو، زەوی‌وزار، سەرمایە).
(٢) شتی دەست بەسەرداگیراو.
-**confiscator** *(n.)*.
**confiteor** (kən-fit′i-ôr′), *n.* نوێژی پاکانەکردن (خاچ پەرستی).
**confiture** (kon′fi-choor′), *n.* مرەبا؛ شیرینی.
**conflagrant** (kən-flā′grənt), *adj.* گڕاوی؛ بڵێسەدار.
**conflagration** (kon′flə-grā′shən), *n.* ئاگرێکی گەورە
(بەتایبەتی کە زیانبەخش‌و وێرانکەر بێت)؛ مەشخەڵ.
**conflation** (kən-flā′shən), *n.* (١) لەیەکدان‌و کردن بە یەك (دوو
شێوەی نووسراوێك). (٢) ئەنجامی ئەم لەیەکدان‌و کردن بە یەکە؛
نووسراوێکی لێکدراوو پێکهاتوو (لە دوو شێوەی جیاوازدا).
**conflict** (kən-flikt′), *v.i.* (١) شەڕکردن؛ بەیەکدادان؛ جەنگ کردن.
(٢) ڕێك نەکەوتن؛ نەگونجان: *( His interests ~ with mine.)*
*n.* (١) شەڕ؛ جەنگ؛ بەیەکداکێشان. (٢) ناکۆکی؛ نەگونجان؛ دووبەرەکی.

(٣) پەشێوی‌و ئاژاوەی ناوخۆی کەسێك (بەهۆی نەگونجانی ئارەزووەکان لەگەڵ یەکتردا).

-confliction *(n.)*; conflictive *(adj.)*.

**conflicting** (kən-flikt′iŋ), *adj.* نەگونجاو؛ ناکۆك *( ~ emotions)*

**confluence** (kon′flo͞o-əns), *n.* (١) بەیەککەیشتن (دوو جۆگە یا ڕووبار)؛ ڕژانە ناو یەك. (٢) (ا) شوێنی ڕژانە یەك یا بەیەککەیشتنی چەند جۆگەیەك ب) ئەو جۆگە تازەیەی کە لەم ڕژانە ناو یەکە پێکدێت.
(٣) کۆبوونەوە؛ بەیەککەیشتن؛ ڕژانە ناو یەك (جەماوەر).
(٤) جەماوەرێك؛ کۆمەڵێك خەڵك.

**confluent** (kon′flo͞o′ənt), *adj.* (١) بەیەککەیشتوو؛ ڕژاونەتە ناو یەکتر؛ ڕژاوەتە یەك: *( ~ streams)*.
(٢) بوون بە یەك (چەند دوومەڵ یا برینێك).
*n.* (١) جۆگەیەك کە بڕژێتە ناو جۆگەیەکی ترەوە. (٢) زێ؛ جۆگە.

**conflux** (kon′fluks), *n.* = confluence.

**confocal** (kon-fō′k'l), *adj.* هەمان تیشکۆی هەیە.

**conform** (kən-fôrm′), *v.t.* (١) وەك یەك لێکردن؛ هاوشێوەکردن: *( He ~ed his ideas to ours.)*
(٢) گونجاندن؛ ڕاهێنان.
*v.i.* (١) وەك یەك وابوون؛ هاوشێوەبوون.
(٢) لەگەڵ گونجان؛ ڕێکەوتن: *( The novel ~ed to my notion of a good story.)*
(٣) ڕەفتارکردن بەپێی؛ پەیڕەوی کردن؛ جووڵانەوە بەپێی ڕێبازو نەریت.
(٤) پەیڕەوی کردنی کڵێسەی ئینگلتەرە.

**conformable** (kən-fôr′mə-b'l), *adj.* (١) گونجاو؛ ڕێکەوتوو
(٢) لەیەك چوو؛ وەك یەك. (٣) ملکەچ؛ پەیڕەویکەر.
(٤) هاوڕێك (چینی زەوی) (زەوی ناسی).

**conformance** (kən-fôr′məns), *n.* = conformity.

**conformation** (kon′fôr-mā′shən), *n.* (١) [Rare]. گونجان؛ گونجاندن؛ سازاندن
(٢) ڕێکخستن‌و ریزکردنی پارچەکانی شتێك لەگەڵ یەکدا بە جوانی.
(٣) شێوە؛ چۆنێتی پێکهاتنی شتێك (بەگوێرەی یەکخستنی بەشەکانی).

**conformist** (kən-fôr′mist), *n.* (١) پەیڕەویکەر؛ گونجاو لەگەڵ خوو و نەریتی کۆمەڵدا. (٢) پەیڕەویکەری کڵێسەی ئینگلتەرە.

**conformity** (kən-fôr′mə-ti), *n.* (١) لەگەڵ گونجان؛ لەیەکچوون.
(٢) پەیڕەوی کردنی ڕەوشت‌و خوو و نەریتی خەڵکی تر یا کۆمەڵگا؛ لاسایی‌کردنەوە. (٣) پەیڕەوی کردن‌و پەسەندکردنی کڵێسەی ئینگلتەرە.

**confound** (kən-found′, kon-found′), *v.t.* (١) تێك‌وپێکدان؛ شێواندن بەسەریەکدا؛ تێکدان؛ تێکەڵاوکردن.
(٢) سەرلێ شێواندن؛ سەرلێ تێکدان.
(٣) [Archaic]. بەزاندن؛ ڕووخاندن؛ فەوتاندن؛ بەسەردا زاڵبوون.
(٤) [Archaic]. شەرمەزارکردن؛ تەریق کردنەوە.
(٥) لەعنەت لێکردن.

**confounded** (kən-foun′did), *adj.* (١) سەرلێ شێواو؛ واق وڕماو.
(٢) بە لەعنەت؛ لەعنەت لێکراو (٣) بۆگەن؛ پیس؛ ناپەسەند.

**confraternity** (kon′frə-tŭr′nə-ti), *n.* (١) برایەتی
(٢) یەکێتی؛ کۆمەڵێك خەڵکی هاوپیشە یا هاوبیروباوەڕ.

**confrere** (kon′frâr), *n.* هاوکار؛ ئاوەڵ.

**confront** (kən-frunt′), *v.t.* (١) بەرەو ڕوو وەستان؛ تووش بوون.
(٢) بەرەنگاربوون؛ ڕووبەڕوو وەستان.
(٣) ڕووبەڕووکردن: *( He ~ed the accused with the evidence.)*.
(٤) بەراووردکردن

**confrontation** (kon′frun-tā′shən), *n.* ڕووبەڕوو وەستان؛ بەرەنگاربوون.

**Confucian** (kən-fū′shən), *adj.* تایبەتی بە " کۆنفیوشەس " و ڕێبازو بیروباوەڕەکەی‌و ئەوانەی پەیڕەوی دەکەن.
*n.* پەیڕەویکەری ڕێبازو فەلسەفەی " کۆنفیوشەس ".

**Confucianism** (kən-fū′shən-iz'm), *n.* ڕێبازو فەلسەفەی " کۆنفیوشەس " کە بریتی‌یە لە دڵسۆزی بۆ باوك‌و دایك، خێزان، برادەر، باووباپیر، هەروەها پاراستنی ئاشتی‌و دادپەرستی.

**confuse** (kən-fūz′), *v.t.* (١) تێك‌وپێکدان؛ تێکەڵاوکردن؛ شێواندن.
(٢) سەرلێ شێواندن؛ سەرلێ تێکدان؛ سەرشێت کردن؛ چەواشەکردن.
(٣) بەهەڵەداچوون؛ نەناسینەوە: *( I ~d you with someone else.)*.

-confusing *(adj.)*.

**confused** (kən-fūzd′), *adj.* (١) سەرلێ شێواو؛ شڵەژاو؛ پەشۆکاو.
(٢) تێکەڵ‌وپێکەڵ؛ شێواو؛ تێکچوو.

-confusedly *(adv.)*.

**confusion** (kən-fū′zhən), *n.* (١) سەرلێ شێوان؛ چەواشەیی؛ حەپەسان؛ تەریق بوونەوە. (٢) پشێوی؛ ئاژاوە؛ پاشاگەردانی.
(٣) بەهەڵەداچوون؛ نەناسینەوە.

**confutation** (kon′fyoo-tā′shən), *n.* (١) بەدرۆخستنەوە؛ سەلماندنی هەڵەیی شتێك یا بیروباوەڕێك. (٢) بەڵگەی بەدرۆخەرەوە.

**confute** (kən-fūt′), *v.t.* (١) بەدرۆخستنەوە؛ سەلماندنی هەڵەیی کەسێك. (٢) سەلماندنی هەڵەیی هەڵوێست یا بیروباوەڕێك بە بەڵگەوە؛ بەدرۆخستنەوە (ووتە، دەنگوباس). (٣) تێك‌وپێکدان؛ لەکەڵك خستن.

**conga** (koŋ′gə), *n.* (١) کۆنگا: جۆرە سەمایەکی ئەمەریکای لاتینی‌یە.
(٢) مۆسیقای ئەم جۆرە سەمایە.

**con game**, [Slang], = confidence game.

**congé** (kon′zhā), *n.* (١) دەرکردن: *( He gave me my ~ .)*.
(٢)ماڵئاوایی کردن؛ خواحافیزی کردن.
(٣) [Archaic]، کڕنووش بردن لەکاتی ماڵئاواییدا.
(٤) نەقشێکی ڕازاندنەوە (خانووسازی).

**congeal** (kən-jēl′), *v.i.* (١) ڕەق بوون (بەهۆی بەستن یا ساردکردنەوە)؛ خەست بوونەوە. (٢) مەیین (ماست، مەحەلەبی)؛ مەیین؛ توندبوونەوە.
*v.t.* (١) ڕەق کردن؛ خەستکردنەوە. (٢) مەیاندن؛ توندکردنەوە.

-congealment *(n.)*.

**congelation** (kon′jə-lā′shən), *n.* (١) مەیین؛ توندبوونەوە.
(٢) شتێکی مەییو یا توندبووەوە.

**congener** (kon′ji-nēr), *n.* هاوجۆر، چین، ڕەگەز یا توخم (مرۆڤ، گیاندار، شت).

-congeneric *(adj.)*; congenerous *(adj.)*.

**congenial** (kən-jēn′yəl), *adj.* (١) (ا) لەیەکچوو؛ لەگەڵ یەك گونجاو: *( ~ tastes)*
(ب) هاوڕەفتارو حەزو ئاحەز: *( ~ friends)*.
(٢) بەدڵبوو؛ باش؛ شیاو؛ پەسەند: *( ~ surroundings)*.

-congeniality *(n.)*.

**congenital** (kən-jen′ə-t'l), *adj.* (١) زگماکی: *( a ~ defect)*.
(٢) ڕەووشت، کردەوە، یا خوویەکی زگماکی: *( a ~ thief)*.

-congenitally *(adv.)*.

**conger** (koŋ′gēr), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی گەورەیە گۆشتەکەی دەخورێت.

**congeries** (kon-jêr′ēz, kon-jêr′i-ēz′), *n.* کۆمەڵ؛ تۆپەڵ.

**congest** (kən-jest′), *v.t.* (١) خوێن تێزان (ئەندامێکی لەش).
(٢) کەڵەکەکردن؛ زۆر پڕکردن؛ قەرەباڵغ کردن؛ بەرگرتن.
*v.i.* (١) خوێن تێزان؛ خوێن تێدا کۆمەڵ بوون.
(٢) زۆر پڕبوون؛ بەستران؛ گیران (لووت لەکاتی هەڵامەتدا)؛ بەرگیران.

**congestion** (kən-jes′chən), *n.* (١) خوێن تێزان (ئەندامی لەش یا دەمار). (٢) (ا) پڕبوون؛ بەستران؛ گیران (لووت لەکاتی هەڵامەتدا)؛ بەرگیران.
(ب) قەرەباڵغی؛ پڕی؛ پەستان بەسەر یەکدا: *( traffic ~ )*.

**congested** (kən-jes′tid), *adj.* (١) خوێن تێزاو.
(٢) (ا) پڕ؛ بەرگیراو؛ گیراو: *( a ~ nose)*.

(ب) قەرەباڵغ: *( a ~ road)*.

**conglobate** (kon-glō′bāt, koŋ′glō-bāt´), *v.t. & v.i.* تۆپەڵ کردن؛ تۆپەڵ بوون؛ خڕبوونەوە.

*adj.* تۆپەڵ؛ تۆپەڵ بوو؛ خڕ؛ خڕبوو.

**-conglobation** *(n.)*.

**conglobe** (kon-glōb′), *v.t. & v.i.* = **conglobate.**

**conglomerate** (kən-glom′ẽr-āt´), *v.t.* کۆمەڵ کردن؛ کردن بە تۆپەڵ.

*v.i.* کۆمەڵ بوون؛ تۆپەڵ بوون؛ بوون بە تۆپەڵ.

*n.* (١) تۆپەڵ؛ کۆمەڵ؛ تۆپەڵێکی هەمەچەشن. (٢) بەردێك کە لە وردە بەردو زیخ و چیمەنتۆ پێك هاتبێت (زەمینناسی). (٣) هاوبەشی یا کۆمپانیایەکی گەورە کە لە چەند کۆمپانیایەکی جیا جیا پێك هاتبێت و هەر کۆمپانیایەك بە جۆرە کارێکەوە خەریك بێت.

*adj.* (١) تۆپەڵ: کۆمەڵ بوو؛ تۆپەڵ کراو.
(٢) هەمەچەشن: هەمەڕەنگ؛ جۆر بە جۆر.
(٣) لە شتی جیا جیا پێکهاتووەو بە کەرەسەیەکی وەك چیمەنتۆ ڕەق بووەو وەك بەردی لێهاتووە (زەمینناسی).

**conglomeration** (kən-glom´ẽr-ā′shən), *n.* (١) کۆمەڵ بوون؛ تۆپەڵ بوون؛ یەکگرتن. (٢) تۆپەڵێکی هەمەچەشنە؛ شتێکی ئاوێتە.
(٣) کۆمەڵ یا تۆپەڵێکی یەکگرتوو.

**conglutinate** (kən-glōō′tə-nāt´), *adj.* بە سریش پێکەوە نووسێنراو؛ بە کەتیرە لێکدراو.

*v.t. & v.i.* پێکەوەنووساندن (بە سریش)؛ پێکەوەنووسان.

**-conglutination** *(n.)*.

**congou** (koŋ′gōō), *n. Also* **congo,** جۆرە چایەکی ڕەشی چینییە.

**congratulate** (kən-grach′ə-lāt´), *v.t.* (١) پیرۆزبایی لێکردن؛ چاوڕوونی لێکردن: *( We ~d the boy on winning the race.)*.
(٢) [Obs.]: ئاهەنگ گێڕان.
(٣) [Obs.]، سڵاولێکردن.

**congratulation** (kən-grach´ə-lā′shən), *n.* (١) پیرۆزبایی: پیرۆزبایی لێکردن؛ پیرۆزبایی کردن
(٢) (*pl.*). پیرۆزبایی؛ پیرۆزبێت!؛ چاوتان ڕوون!؛ خۆشی لە خۆت!.

**congratulator** (kən-grach′ə-lā´tẽr), *n.* پیرۆزباییکەر

**-congratulatory** *(adj.)*.

**congregate** (koŋ´grə-gāt′), *v.t.* کۆکردنەوە؛ کۆڕ پێ بەستن.

*v.i.* کۆبوونەوە؛ کۆڕبەستن.

*adj.* (١) کۆ؛ کۆبووەوە؛ پێکەوە. (٢) گشتی؛ هەموو.

**congregation** (koŋ´grə-gā′shən), *n.* (١) کۆبوونەوە
(٢) کۆمەڵێك خەڵك کە پێکەوە کۆبووبنەوە.
(٣) دەستەی نوێژکەران؛ کۆمەڵێك نوێژکەر لە پەرستگادا؛ کۆمەڵێك خەڵك لە پەرستگادا. (٤) ئەندامانی پەرستگایەك؛ ئەندامانی کلێسەیەك.
(٥) ئاوەدانییەك یا ئاوایییەك لە سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی ئەمەریکای باکوور.
(٦) جورلەکە؛ جوولەکەکان. (٧) لیژنەیەك لە کەڵە قەشەکان.

**congregational** (koŋ´grə-gā′shən-'l), *adj.* (١) تایبەتی بە ئەندامانی پەرستگایەك؛ وەك کۆمەڵێك نوێژکەران لە پەرستگایەکدا؛ تایبەتی بەم کۆمەڵە. (٢) [C-]، تایبەتییە بە سەربەستی هەموو پەرستگایەك و ئەندامەکانی.

**congregationalism** (koŋ´grə-gā′shən-'l-iz'm), *n.* (١) شێوەیەکە لە ڕێکخراوی کلێسەیی کە سەربەستی دەدات بە هەموو کلێسەیەك و ئەندامەکانی کە سەر بەم ڕێکخراوەن. (٢) [C-]، بیروباوەڕو ڕێبازی لقێکە لە ئاینی پرۆتستانتی کە سەربەستی دەدات بە کلێسەو ئەندامانی ئەو کلێسانەی کە سەر بەون

**congress** (koŋ′grəs), *n.* (١) کۆبوونەوە؛ یەکگرتن.
(٢) جووت بوون؛ گان. (٣) پەیوەندی کۆمەڵایەتی.
(٤) کۆنگرە؛ کۆبوونەوەیەکی گەورە.
(٥) ئەنجوومەنی تایبەتی کە نوێنەرانی میللەتان و ئاینەکانی تێدایە بۆ باسکردنی گیروگرفتی جیهانی.
(٦) ئەنجوومەنی نوێنەران (هی گشت وڵاتێك)؛ پەرلەمان؛ کۆنگرێس.
(٧) [C-]، (ا) ئەنجوومەنی نوێنەرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هەردوو لقەکەیەوە؛ کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
(ب) کۆبوونەوەیەکی ئەم ئەنجوومەنە.
(ج) سەرجەمی ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە کە پێکەوە کاردەکەن بۆ ماوەی دوو ساڵ.

**congressional** (kən-gresh′ən-'l), *adj.* (١) تایبەتی بە ئەنجوومەنێك یا کۆبوونەوەکانی. (٢) [C-]، تایبەتی بە کۆنگرێسی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**Congressional district,** ناوچەیەك لە ناوچەکانی هەڵبژاردن لە یەکێك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە هەر دوو ساڵ جارێك نوێنەرێك هەڵدەبژێرێت بۆ کۆنگرێسی ئەمەریکی کە لە واشنتۆن کۆدەبێتەوە.

**congressman** (koŋ′grəs-mən), *n.* ئەندامی کۆنگرێسی ئەمەریکی؛ نوێنەری گەل؛ نوێنەر (بەتایبەتی لە کۆنگرێسی ئەمەریکیدا).

**congresswoman** (koŋ′grəs-woom´ən), *n.* ئەندامێکی ژنی کۆنگرێسی ئەمەریکی؛ نوێنەرێکی ژنی گەل؛ نوێنەری ژن (بەتایبەتی لە کۆنگرێسی ئەمەریکیدا).

**congruence** (koŋ′grōō-əns), *n.* (١) گونجان؛ لەیەکچوون.
(٢) شیان؛ بەجێیی. (٣) لەگەڵ یەك ڕێکەوتن؛ پێکەوە گونجان (ڕێزمان)
(٤) (ا) پەیوەندی نێوان دوو ژمارەیە کە ئەگەر دابەشیان بکەیت بەسەر هەمان ژمارەدا ئەوەی لێی دەمێنێتەوە وەك یەك وادەبێت (بیرکاری).
(ب) جووت بوون (ئەندازە)؛ جووتی؛ یەك بەیەکی.

**congruency** (koŋ′grōō-ən-si), *n.* = **congruence.**

**congruent** (koŋ′grōō-ənt), *adj.* (١) لەگەڵ یەك گونجان؛ لەیەکچوون. (٢) لەگەڵ ڕێکەوتن؛ لەگەڵ گونجان (ڕێزمان).
(٣) جووت بوون (ئەندازە)؛ جووتی؛ یەك بەیەکی.
(٤) ئەگەر دابەش بکرێن بەسەر هەمان ژمارەدا ئەوەی کە دەمێنێتەوە وەك یەك وادەبێت (بیرکاری).

**congruity** (kən-grōō′ə-ti), *n.* (١) لەگەڵ یەکدا گونجان؛ گونجان؛ شیان؛ ڕێکەوتن. (٢) جووت بوون (ئەندازە)؛ یەك شێوەیی؛ یەك بەیەکی.

**congruous** (koŋ′grōō-əs), *adj.* گونجاو؛ شیاو؛ ڕێکەوتوو؛ بەجێ؛ شیاو؛ پەسەند.

**conic** (kon′ik), *adj.* قووچەکی؛ شێوە قووچەکی.

**conical** (kon′i-k'l), *adj.* = **conic.**

**conics** (kon′iks), *n.pl.* ئەو بەشەی ئەندازەناسی کە لە شێوەی قووچەکی دەکۆڵێتەوە.

**conic section,** شێوەی قووچەکی (ئەندازە).

**conifer** (kō′nə-fẽr, kon′ə-fẽr), *n.* داری سنەوبەر.

**-coniferous** *(adj.)*.

**conjectural** (kən-jek′chẽr-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕەمڵ لێدان؛ بەپێی ڕەمڵ لێدانە؛ گۆترەکارییە. (٢) حەز لە ڕەمڵ لێدان دەکات.

**conjecture** (kən-jek′chẽr), *n.* ڕەمڵ لێدان؛ گۆترەکاری؛ وادانان؛ گۆترە؛ مەزەندە.

*v.t. & v.i.* ڕەمڵ لێدان؛ گۆترەکاری کردن؛ وادانان؛ لاوابوون؛ مەزەندەکردن.

**conjoin** (kən-join′), *v.t. & v.i.* پێکەوەبەستن؛ بەیەك گەیاندن؛ یەك پێگرتن؛ یەکگرتن؛ کردن بە یەك؛ بوون بە یەك؛ کۆکردنەوە؛ لەیەکدان.

**conjoint** (kən-joint′), *adj.* (١) یەکگرتوو؛ پێکەوە.
(٢) دووقۆڵی؛ دوولایی؛ ئاوکۆیی.

**conjointly** (kən-joint′li), *adv.* پێکەوە؛ بە یەکگرتوویی.

**conjugal** (kon′joo-gəl), *adj.* تایبەتی بە ژن و مێرد؛ هی ژن‌ومێردایەتی.

**-conjugality** *(n.)*.

**conjugate** (kon′joo-git), *adj.* (١) جووتە؛ دووانە؛ پێکەوە بەستراو

(٢) جووت جووت؛ دووانە (گەلاّ)؛ دوو گەلاّ بە یەك لاسكەوە.
(٣) لە هەمان ڕەگەوە وەرگیراوە (ووشە)؛ هاوڕەگ و هاومانا (ووشە) .
(٤) دوو خاڵ؛ هێڵ یا هەندی لەیەكچوو (بیركاری).
***n.*** دوو ووشەی هاوڕەگ و هاومانا.
***v.t.*** (١) بەیەك گەیاندن؛ جووت كردن؛ كردن بە یەك؛ یەك پێگرتن.
(٢) گەردانكردنی كردار (ڕێزمان):
**( write- wrote- written; play- played- played )**
***v.i.*** (١) [Rare] ، جووت بوون (ژن و پیاو).
(٢) یەك پێگرتن؛ یەكخستن (ڕووەكناسی) .
(٣) (ا) گەردانكردنی كردار (ڕێزمان) . (ب) گەردان بوونی كردار.
**conjugation** (kon´joo-gā′shən), ***n.*** (١) یەكگرتن؛ بوون بە یەك؛ جووت بوون؛ پێكەوەبەستن.
(٢) بەیەكداچوونی دوو ڕووەكی یەك شانە بە مەبەستی زاووزێ.
(٣) گەردانكردنی كردار (ڕێزمان):
**( speak- spoke- spoken; smile- smiled- smiled )**
**-conjugational** ***(adj.)*;** **conjugator** ***(n.)*.**
**conjunct** (kən-juŋkt′, kon′juŋkt), ***adj.*** [Archaic]. یەكگرتوو؛ پێكەوە بەستراو؛ یەكبوون.
**conjunction** (kən-juŋk′shən), ***n.*** (١) بە یەك گەیاندن؛ پێكەوە بوون بە یەك؛ لەگەڵ. (٢) ڕێكەوتن؛ هاوكات (ڕوودان): ***( the ~ of events)*** .
(٣) نزیكی دوو ئەستێرە لەیەكترەوە: ***( planets in ~ )*** .
(٤) ئامرازی لێكدەر؛ ئامرازی پەیوەندی:
**( and, but, or, through, because, etc.)**
**conjunctiva** (kon´juŋk-tī′və), ***n.*** پێستی دیوی ناوەوەی پێلووی چاو و دیوی دەرەوەی چاو.
**conjunctive** (kən-juŋk′tiv), ***adj.*** (١) یەكگرتوو؛ جووت بوو.
(٢) لەیەكدەر؛ گەیەنەر. (٣) لێكدەر (ئامراز، ووشە) .
***n.*** ئامراز یا ووشەی لێكدەر (ڕێزمان): **( and, but, unless, through )** .
**-conjunctively** ***(adv.)*.**
**conjunctivitis** (kən-juŋk´tə-vī′tis), ***n.*** هەوكردنی پێستی دیوی ناوەوەی پێلووی چاو.
**conjuncture** (kən-juŋk′chēr), ***n.*** (١) بوون بە یەك؛ یەكگرتن.
(٢) ڕوودانی چەند شتێك پێكەوە؛ یەكگرتنی چەند ڕووداوێك.
(٣) تەنگوچەڵەمە؛ گیروگرفت.
**conjuration** (kon´joo-rā′shən), ***n.*** (١) بانگ كردن؛ داوالێكردن؛ بانگ. (٢) دزعای جادووگەر. (٣) جادووگەری.
(٤) [Archaic]، لە خوا پاڕانەوە.
**conjure** (kən-joor′), ***v.i.*** (١) بانگ كردن و هێنانەڕووی جنۆكەو دێوو درنج (٢) جادووگەری كردن؛ سیحربازی كردن.
***v.t.*** (١) داوالێكردن؛ لێ پاڕانەوە؛ تكالێكردن:
***( I ~ you in the name of God to help me.)***
(٢) بانگ كردن و هێنانە پێشەوەی جنۆكەو دێوو درنج.
(٣) (ا) ( ~ up )، هێنانە بەرچاو؛ هێنانەوە بیر:
***( She ~d up visions of a better life.)***
(ب) ( ~ away )، ڕەواندنەوە؛ بەبادان؛ لەبیربردنەوە:
***( The music ~d my troubles away.)***
**conjurer, conjuror** (kən-joor′ēr), ***n.*** (١) جادووگەر.
(٢) تكاكەر؛ پاڕەرەوە.
**conk** (koŋk), ***n.*** [Slang], (١) [British] ، لووت. (٢) سەر.
(٣) بەسەردا ماڵین؛ پیاماڵین.
***v.t.*** [Slang], پیاماڵین؛ بەسەردا ماڵین.
**conk out,** [Slang], (١) لەپڕ لەكاركەوتن (مەكینە)؛ پەككەوتن.
(٢) ماندووبوون؛ بەلاداهاتن و خەولێكەوتن لە ماندووییدا.
**con man,** [Slang], = **confidence man.**
**conn** (kon), ***v.t.*** پاپۆڕ یا بەلەم لێخوڕین.

***n.*** لێخوڕین (پاپۆڕ، بەلەم).
**connate** (kon′āt), ***adj.*** (١) زگماكی؛ خۆیی.
(٢) هاوبنچینە؛ هاوسەرچاوە؛ هاوسرووشت.
(٣) لە زگماكییەوە پێكەوەنووسان (ڕووەكناسی) .
**connation** (kə-nā′shən), ***n.*** لە زگماكییەوە پێكەوەنووسان.
**connatural** (kə-nach′ēr-əl), ***adj.*** (١) زگماكی؛ سرووشت كرد؛ خۆیی. (٢) هاوبنچینە؛ هاوسەرچاوە؛ هاوسرووشت.
**connect** (kə-nekt′), ***v.t.*** (١) پێكەوەنووساندن؛ پێكەوەلكاندن؛ جووت كردن؛ لێكدان؛ پێكەوەبەستن؛ هەڵبەستن.
(٢) وەك یەك سەیركردن (لە مێشكدا)؛ بەیەكەوە بەستن (لە مێشكدا):
***( We ~ orange blossoms with weddings.)***
(٣) گەیاندن بە؛ بە یەك گەیاندن:
***( The operator will ~ you with New York.)***
(٤) پێكەوەبەستن (كارەبا) .
***v.i.*** (١) پێكەوەنووسان؛ پێكەوەلكان.
(٢) گەیشتن و یەكگرتنەوە لە كاتی دیاریكراودا (شەمەندەفەر، پاس، فڕۆكە) بۆئەوەی ڕێبوار بە قۆناغی دووەمی گەشتەكەیدا بكات) .
(٣) شیان؛ گونجان؛ ڕێكەوتن.
(٤) [Slang]، سەركەوتووبوون لە لێدانی تۆپێكدا (وەرزش) .
**connected** (kə-nek′tid), ***adj.*** (١) پێكەوە بەستراو؛ پێكەوە لكێنراو؛ لكاو؛ لێكدراو. (٢) گونجاو و مانابەخش (نووسراو، بیروباوەڕ، چیرۆك).
(٣) پەیوەندیدار.
-connectedly ***(adv.)*.**
**connecter** (kə-nek′tēr), ***n.*** = **connector.**
**connecting rod,** شیشی بەیەكگەیەنەر (مەكینەی ئۆتۆمبیل) .
**connection** (kə-nek′shən), ***n.*** (١) پێكەوەبەستن؛ پێكەوەلكاندن؛ بەستن؛ جووت بوون؛ لێكدان. (٢) لێكدەر؛ هۆی لێكدان؛ گەیەنەر؛ پەیوەست.
(٣) پەیوەندی: (ا) چەند شتێكی پێكەوە بەستراو؛ پەیوەستی.
(ب) گونجان و مانا بەخشین (نووسراو، چیرۆك، هەڵبەست)؛ پەیوەستی.
(ج) مەیدانی ووتەو نووسراو؛ چوارچێوە یا قالبی ووتەو نووسراو؛ پەیوەستی
(د) پەیوەندی خزمایەتی یا هاوپیشەیی.
(٤) (*pl.*)، (ا) خزم (بەتایبەتی لەڕێی ژن و ژنهێنانەوە).
(ب) ناسیاوێكی بەدەسەڵات؛ پشت: ***( He has powerful ~s.)*** .
(٥) (*pl.*)، گۆڕینی هۆی هاتوچۆ لەلایەن ڕێبوارەوە بەتایبەتی لەكاتی گەشتی دوورودرێژدا (چونكە ئەو فڕۆكە، شەمەندەفەر، یا پاسەی سواری دەبێت لە سەرەتای گەشتەكەدا لەوانەیە هەرچەند قۆناغێك بتبات بەرەو جێی مەبەست یا دواقۆناغ، چونكەر هەر یەكە ڕێی دیاریكراوی خۆیەیە).
(٦) تاقمێك خەڵكی هاوپیشە یا هاوئاین. (٧) لقێكی ئاینی.
(٨) تەل كارەبا (كە تەووژمی كارەبای پێدا دەڕوات). (٩) هێڵی تەلەفۆن.
-connectional ***(adj.)*.**
**in connection with,** (١) دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ لەم ڕووەوە.
(٢) لەگەڵ؛ پێكەوە.
**connective** (kə-nek′tiv), ***adj.*** تایبەتی بە پێكەوەبەستن؛ پێكەوەبەست.
***n.*** ئامرازی لێكدەر؛ ئامرازی پەیوەندی؛ ووشەی پەیوەست؛ لكێنەر (ووشە).
**( and, but, or, unless, although, etc.)**
**connective tissue,** تێشووی پێكەوەبەست (لەش) .
**connector** (kə-nek′tēr), ***n.*** لێكدەر (مرۆڤ، ئامێر، ووشە، ئامراز)؛ لكێنەر؛ گەیەنەر؛ ووشە یا ئامرازی پەیوەندی.
**connexion** (kə-nek′shən), ***n.*** = **connection.**
**conning tower,** (١) قوللەی لێخوڕین و ڕوانین (پاپۆڕی جەنگی)
(٢) قوللەی ڕوانین؛ ڕوانگە (ژێردەریایی) .
**conniption** (kə-nip′shən), ***n.*** [Colloq.], تووڕەبوون یا هیستریایەكی سەردەمی؛ حاڵ لێهاتن (منداڵ) .
**connivance** (kə-nīv′əns), ***n.*** (١) خۆ لێ گێل كردن (تاوان) .

(۲) چاو لێ نووقاندن (تاوان)؛ چاو لێ پۆشین و هاندانی کردنی تاوانێک؛ پیلان.
**connive** (kə-nīv′), *v.i.* (۱) چاوپۆشین (له کردەوەی ناپەسەند)؛
خۆ گێل کردن له تاوانێک یا بەدکارییەك وە حەزکردن بە سەرکەوتنی له دڵەوە.
(۲) ( with ~ ) پیلان گێڕان؛ بە نهێنی هاوکاری کردن له کاری ناپەسەندا.
-conniver *(n.)*.
**connivent** (kə-nīv′ənt), *adj.* سەرەکانیان لەیەك دەدەن؛
بەرەو یەك چوو (باڵی مێش و مەگەز، نێرەکی ڕووەك).
**connoisseur** (kon′ə-sûr′), *n.* شارەزا (خواردن و خواردنەوە)؛
سەردەرچوو؛ بزان.
**connotation** (kon′ə-tā′shən), *n.* (۱) واگەیاندن (مانا).
(۲) واتا یا مانای ووشەیەك زیاد لە مانای بنچینەیی ووشەکە:
*( "Politician" has different ~s from "statesman".;*
*Some words have good ~s while others have bad ~s.)*
(۳) مانای گشتی و تایبەخۆی ووشەیەك (ژیربێژی).
-connotative *(adj.)*.
**connote** (kə-nōt′), *v.t.* واگەیاندن؛ گەیاندن (مانا)؛ مانا گەیاندن
زیاد لە مانای بنچینەیی ووشەکە:
*( The word "mother" ~s love, care, tenderness, etc.;*
*The word "politician" ~s opportunism, dishonesty, etc.)*
**connubial** (kə-nōō′bi-əl, kə-nū′bi-əl), *adj.* ژن و مێردایەتی؛
تایبەتی بە ژن و مێردایەتی.
-connubiality *(n.)*; connubially *(adv.)*.
**conoid** (kō′noid), *adj. Also* **conoidal**, قووچەکی
*n.* شتێکی قووچەکی؛ وێنەیەکی قووچەکی (ئەندازە)؛ قووچەك.
**conquer** (koŋ′kēr), *v.t.* (۱) داگیرکردن؛ دەست بەسەردا گرتن.
(۲) بەزاندن؛ شکاندن؛ بەسەردا زاڵبوون: *( We ~ed the enemy.)*.
*v.i.* زاڵبوون؛ بردنەوە
**conqueror** (koŋ′kēr-ēr), *n.* (۱) داگیرکەر؛ زەوتکەر.
(۲) زاڵ؛ بەزێنەر.
**conquest** (koŋ′kwest, kon′kwest), *n.* (۱) داگیرکردن؛ گرتن؛
شکان؛ بەزان. (۲) شتێکی داگیرکراو (ووڵات، گەل، تالانی).
(۳) (ا) دڵفڕاندنی کەسێك. (ب) کەسێکی دڵفڕێنراو.
**conquian** (koŋ′ki-ən), *n.* کۆنکەن: جۆرە یارییەکی کاغەزە.
**conquistador** (kon-kwis′tə-dôr′), *n.* یەکێك لە ئیسپانییە
داگیرکەرەکانی مەکسیك یا پیرۆ یا ووڵاتانی تری ئەمەریکا لەسەدەی
شانزەهەمدا.
**consanguine** (kon-saŋ′gwin), *adj.* = consanguineous.
**consanguineous** (kon′saŋ-gwin′i-əs), *adj.* خزم و خوێش؛
خزم؛ هاوخوێن؛ هاو باووباپیر.
**consanguinity** (kon′saŋ-gwin′ə-ti), *n.* خزمایەتی: خزمی؛
خزم و خوێشی؛ هاوخوێنی؛ هاو باووباپیری.
**conscience** (kon′shəns), *n.* دەروون؛ ویژدان.
**in all conscience,** (۱) لە هەقیانەتدا؛ بەپێی هەقیانەت؛
ئەگەر هەقیانەتت دەوێت. (۲) بێ گومان؛ بە ڕاستی؛ لە ڕاستیدا.
**on one's conscience,** هەستکردن بە بێ ویژدانی (لەئەنجامی کردنی
کارێکدا کە دەزانێت نارەوایە)؛ هەست بە گوناهباری کردن؛ لە ئەستۆدا بوون.
**conscienceless** (kon′shəns-lis), *adj.* بێ ویژدان؛ دەروون ڕەش.
**conscience money,** پارەی ویژدان: پارەیەکە دەدرێت بۆ سووك
کردنی باری ویژدان (کەسێك دەیدات کە هەست بە گوناهباری بکات لەبەر
کردنی شتێك کە نەدەبوو بیکات یا نەکردنی شتێك کە دەبوو بیکات).
**conscience-stricken** (kon′shəns-strik′ən), *adj.* هەست بە
گوناهباری کردن (لەبەر کردنی کارێکی خراپە).
**conscientious** (kon′shi-en′shəs, kon′si-en′shəs), *adj.* بە
ویژدان؛ خاوەن ویژدان؛ سەرڕاست؛ ڕاست: *( a ~ worker)*.
**conscientious objector,** کەسێکە کە نەیەوێت چەك هەڵگرێت یا

بچێتە ناو سوپاوە چونکە دژی جەنگ و پیاوکوشتنە و ئاشتیخوازە (بەتایبەتی
ئەندامی هەندێك کۆمەڵی ئاینی).
**conscionable** (kon′shən-ə-b′l), *adj.* ڕەوا؛ هەق.
**conscious** (kon′shəs), *adj.* (۱) بەهۆش؛ بەئاگا؛ هۆشمەند.
(۲) ووریا؛ هۆشیار؛ ئاگادار؛ بزان. (۳) شەرمن؛ زوو تەریق دەبێتەوە.
(٤) هەستپێکەر: *( ~ guilt)*.
(٥) دەسمەنقەست: *( a ~ insult)*.
-consciously *(adv.)*.
**the conscious,** مێشکی ئاگادار: ئەو بەشەی چالاکی مێشکە کە مرۆڤ
خۆی پێی دەزانێت و لەلای ئاشکرایە و ئاگای لێیەتی (دەروونناسی)؛
هەستی پێ زانراو؛ بیروهۆشی بەئاگا.
**consciousness** (kon′shəs-nis), *n.* (۱) هۆش؛ هۆشیاری؛
بەئاگایی. (۲) بیروهۆش و هەست و نەست و بیروباوەڕ و حەزونەزی مرۆڤ.
(۳) بیروهۆشی بەئاگا (دەروونناسی)؛ بیروهۆشی هەستپێکراو.
(٤) (ا) ئاگاداربوونی مرۆڤ لە باری ژیانی خۆی.
(ب) ئاگاداربوونی کەسێك لە باری ژیان بەگشتی و چەوسانەوەی گەل،
چینێك یا ڕەگەزێك بەتایبەتی.
**consciousness-raising,** ووریابوونەوە؛ ووریاکردنەوە:
ئاگادارکردنی مرۆڤ لە باری ناڕەوای ژیان و چەوسانەوەی گەل تاوەکو
ئامادەبێت بۆ گۆڕینی.
**conscript** (kən-skript′), *v.t.* (۱) بەزۆر گرتن بە سەرباز.
(۲) بێگارپێکردن (لەلایەن میرییەوە).
*adj.* بەزۆر گیراو بە سەرباز.
*n.* سەربازێکی بەزۆر گیراو؛ کەسێك کە بەزۆر گیرابێت بە سەرباز.
**conscription** (kən-skrip′shən), *n.* (۱) سەربازگرتن؛ سەربازگری.
(۲) بێگار (بۆ میری). (۳) سەرانەیەکە میری لە گەل دەسەنێت لەکاتی جەنگدا.
**consecrate** (kon′sə-krāt′), *v.t.* (۱) (ا) پیرۆزکردن:
*( ~ a church)*
(ب) پیرۆزکردن: *( The bishop ~d the bread and wine.)*.
(۲) کردنی قەشەیەك بە سەرەك قەشە لە ئاهەنگێکی ئاینیدا.
(۳) تەرخان کردن: *( He ~d his life to art.)*.
(٤) پیرۆزکردن؛ پلەی پیرۆزی پێدان: *( a tradition ~d by time)*.
*adj.* [Rare], پیرۆز.
**consecrated** (kon′sə-krā′tid), *adj.* پیرۆزکراو؛ پیرۆز.
**consecration** (kon′sə-krā′shən), *n.* (۱) ئاهەنگی پیرۆزکردن؛
پیرۆزکردن. (۲) پیرۆزی؛ پیرۆزکراوی.
-consecrator *(n.)*.
**consecution** (kon′sə-kū′shən), *n.* (۱) بەرەو دوایی؛ زنجیرە.
(۲) پەیوەندی بیرێك بەو بیرەی کە لە پێشێوەیەتی و ئەوەیشی کە لە دواوەیەتی
(ژیربێژی).
**consecutive** (kən-sek′yoo-tiv), *adj.* (۱) یەك لە دوای یەك؛
بەرەو دوا بەبێ پچڕان: *( four ~ weeks)*.
(۲) هەموو بەشەکان پەیوەندییان هەیە لەگەڵ یەکتریدا (چیرۆك، دووان... هتد).
(۳) ئەنجامدەر (ڕێزمان).
-consecutively *(adv.)*.
**consensual** (kən-sen′shōō-əl), *adj.* (۱) بە ڕەزامەندی هەردوولا
کراوە: *( a ~ contract)*. (۲) خۆنەویست.
**consensus** (kən-sen′səs), *n.* یەکێتی بیروباوەڕ؛ ڕێککەوتن-
(بیروباوەڕ)؛ پێکهاتنی بیروباوەڕی گشت خەڵك دەربارەی مەسەلەیەك؛
ڕا لەسەر بوونی گشتی: *( They rule the country by ~.)*.
**consent** (kən-sent′), *v.i.* ڕێککەوتن؛ ڕازی بوون؛ پەسەندکردن.
*n.* . ڕێککەوتن؛ ڕا لەسەر بوون؛ پەسەندکردن: *( by common / general ~ )*.
**consentaneous** (kon′sen-tā′ni-əs), *adj.* (۱) ڕێککەوتوو؛
پێکەوە گونجاو. (۲) بە یەك دەنگ؛ هەموو؛ ڕای هەمووی لەسەرە.
**consentient** (kən-sen′shənt), *adj.* هەموو یەك دەنگن؛

به ڕای گشتی

**consequence** (kon′si-kwens′, kon′si-kwəns), *n.* (١) بەرەو دوایی (٢) ئەنجام. (٣) پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام. (٤) گرنگی هۆیەك یا مەسەلەیەك: *( a matter of no ~ )*. (٥) گرنگی و بەدەسەلاتی كەسێك: *( a person of ~ )*.

**in consequence,** لەئەنجامدا؛ لەبەرئەوە؛ كەوابوو.

**in consequence of,** لە ئەنجامی ئەوەدا؛ بەهۆی ئەوەوە؛ لەبەرئەوە.

**take the consequences,** قایل بوون بە ئەنجامی كردەوەی خۆ

**consequent** (kon′si-kwent′, kon′si-kwənt), *adj.* (١) لەوەوە هاتووە؛ لە ئەنجامی ئەوە. (٢) پاشكۆیەتی. (٣) یەك لەدوای یەكە.

***n.*** (١) پاشكۆ؛ شتێك كە لەدوای شتێكی ترەوە بێت. (٢) ئەنجام. (٣) دووەم بەشی ڕێژەیەك یا كەرتێك (بیركاری).

**consequent on (or upon ),** لە ئەنجامی ئەوەدایە.

**consequential** (kon′si-kwen′shəl), *adj.* (١) لە ئەنجامدایە؛ ئەنجامە. (٢) لەخۆبایی؛ بەفیز؛ گومڕا؛ كەشخەچی؛ تڕزل. (٣) [Rare]، گرنگ.

**-consequently** *(adv.)*.

**conservancy** (kən-sûr′vən-si), *n.* (١) پاراستنی سامانە سرووشتییەكان (وەك: دارستان، ئاوی ڕووبارو دەریاچە، گیانداری كێوی). (٢) لیژنەی پاراستنی سامانی سرووشتی لە ئینگلتەرە.

**conservation** (kon′sẽr-vā′shən), *n.* (١) پاراستن؛ هێشتنەوە؛ بەفیڕۆنەدان (٢) پاراستن یا پارێزگاری كردنی سامانە سرووشتییەكان (وەك دارستان، ئاوی ڕووبارو دەریاچە؛ گیانداری كێوی... هتد).

**conservationist** (kon′sẽr-vā′shən-ist), *n.* پارێزەری سامانە سرووشتییەكان

**conservation of energy,** مانەوەی ووزە وەك خۆی و نەفەوتانی (فیزیا)

**conservatism** (kən-sûr′və-tiz′m), *n.* كۆنەپارێزی؛ پاراستنی نەریت و ڕێبازی كۆن؛ كۆنەپەرستی؛ هێشتنەوەی باری شتێك وەك خۆی و بەرهەڵستی كردنی گۆڕینی؛ ڕێبازو بیروڕای حیزبێك یا كۆمەڵێكی كۆنەپەرست.

**conservative** (kən-sûr′və-tiv), *adj.* (١) كۆنەپەرست؛ كۆنەپارێز؛ حەزكەر بە پاراستنی نەریت و ڕێبازی كۆن: *( a ~ political party)*. (٢) تایبەتی بە فەلسەفەو هەڵوێستی كۆنەپەرستی *( ~ views)*. (٣) [C-]، تایبەتی بە حیزبی ڕاستڕەو یا كۆنەپەرستی ئینگلتەرەو كەنەدا. (٤) مام ناوەندی؛ ناوەندی (خەملاندن): *( a ~ estimate)*. (٥) كۆن؛ كۆنەباو *( a ~ suit)*. (٦) پارێزەر؛ نەفەوتێنەر.

***n.*** (١) كەسێكی كۆنەپەرست؛ كۆنەپەرست؛ كۆنەپارێز (٢) [C-]، ئەندامی حیزبێكی ڕاستڕەو یا كۆنەپەرستی ئینگلتەرەو كەنەدا. (٣) كەسێكی پارێزەر؛ نەفەوتێنەر.

**conservator** (kon′sẽr-vā′tẽr, kən-sûr′və-tẽr), *n.* پارێزگار؛ پارێزەر؛ پێ سپێردراو؛ پاسەوان.

**conservatory** (kən-sûr′və-tô′ri, kən-sûr′və-tō′ri), *adj.* تایبەتی بە پارێزگاری یا پاراستن

***n.*** (١) زانستگای مۆسیقا یا شانۆ؛ زانستگای هونەر. (٢) ژووری پاراستن و پیشاندانی ڕووەك و گوڵ؛ شەتڵگا؛ جامخانەی گوڵ و نەمام.

**conserve** (kən-sûrv′), *v.t.* (١) پاراستن؛ پارێزگاری كردن؛ هەڵگرتن؛ هێشتنەوە؛ بەفیڕۆنەدان: *( C~ your energy.)*. (٢) مرەبا درووستكردن؛ مرەباگرتنەوە.

***n.pl.*** مرەبایەكی دوو میوە.

**consider** (kən-sid′ẽr), *v.t.* (١) لێ ووردبوونەوە؛ تەماشاكردن؛ تێبینین؛ لێكۆڵینەوە (٢) بیرلێكردنەوە: *( Let's ~ the problem.)*. (٣) بایەخ پێدان؛ لێكدانەوە؛ ڕەچاوكردن: *( Her behavior is not hard to understand if you ~ her background.)* (٤) دڵی خەڵك ڕاگرتن: *( You have to ~ other people.)*. (٥) وادانان؛ دانان: *( Money is generally ~ed important.)*. (٦) بڕوا وابوون (پاش بیرلێكردنەوە): *( We ~ him guilty.)*. (٧) بە خەیاڵداهاتن؛ بیرلێكردنەوەو پەسەندكردن: *( Would you ~ going with us?)*

***v.i.*** بیركردنەوە.

**considerable** (kən-sid′ẽr-ə-b'l), *adj.* (١) زۆر؛ ئێجگار زۆر (پلە، هەند، ڕادە): *( a ~ amount of money)*. (٢) شایستەی بیرلێكردنەوەیە؛ گرنگ.

-considerably *(adv.)*.

**considerate** (kən-sid′ẽr-it), *adj.* دڵی خەڵك ڕاگر؛ بەهەست؛ بە تەنگ هەستی خەڵكەوە هاتوو.

**consideration** (kən-sid′ə-rā′shən), *n.* (١) لێكۆڵینەوە؛ لێ ووردبوونەوە: *( The matter is under ~ .)*. (٢) دڵی خەڵك ڕاگرتن؛ بە تەنگ دڵ و هەستی خەڵكەوە هاتن. (٣) ڕێز؛ ڕێزلێگرتن. (٤) بیر؛ ڕا؛ بیروڕا. (٥) شتێكی بە بایەخ لە بڕیاردانێكدا. (٦) گرنگی؛ بایەخ. (٧) پاداشت؛ كرێ.

**in consideration of,** (١) لەبەر؛ بەهۆی. (٢) بەرامبەر بە؛ لە پاداشتی ئەوەدا.

**on no consideration,** هەرگیز؛ قەت.

**take into consideration,** بایەخ پێدان؛ ڕەچاوكردن؛ لێكدانەوە.

**under consideration,** لێی دەكۆڵرێتەوە (بۆ ئەوەی بڕیاری لەسەر بدرێت)؛ بیری لێ دەكرێتەوە.

**considered** (kən-sid′ẽrd), *adj.* (١) بەووردی لێی كۆڵراوەتەوە؛ بیرلێكراوە. (٢) بەڕێز.

**considering** (kən-sid′ẽr-iŋ), *prep.* ڕەچاوكردن؛ ئەگەر هەموو شتێك لێك بدەینەوە؛ ئەگەر حساب بۆ هەموو شتێك بكەین.

*adv.* [Colloq.], ڕەچاوكردن؛ ئەگەر حساب بۆ هەموو شتێك بكەین.

**consign** (kən-sīn′), *v.t.* (١) خستن؛ خستنەناو؛ ناردن: *( to ~ to hell; They ~ed him to jail.)* (٢) پێ سپاردن (ئەمانەت)؛ دانە دەست؛ كردن بە لێپرسراو: *( C~ the orphan to her uncle's care.)* (٣) دانان؛ بۆ دانان؛ تەرخان كردن. (٤) شتومەك ناردن بۆ نوێنەرێك لە شار یا وولاتێكی تر بۆ فرۆشتن یا عەماركردن. (٥) [Obs.]، مۆركردن؛ ئیمزاكردن؛ پەنجەپیانان.

**-consignation** *(n.)*; **consignable** *(adj.)*.

**consignee** (kon′sī-nē′, kon′si-nē′), *n.* بۆ نێردراو: نوێنەری كۆمپانیایەك یا ووردەفرۆشێك كە شتومەكی بۆ دەنێردرێت تاوەكو بیفرۆشێت

**consigner** (kən-sī′nẽr), *n.* = **consignor.**

**consignment** (kən-sīn′mənt), *n.* (١) ناردنی شتومەك بۆ ووردە-فرۆشێك یا نوێنەرێك لەلایەن كۆمپانیایەكەوە بۆ فرۆشتن یا هەڵگرتنی. (٢) شتێكی نێردراو (بەتایبەتی بارگەیەك شتومەك كە بنێردرێت بۆ نوێنەری كۆمپانیایەك بۆ فرۆشتن یا هەڵگرتنی).

**on consignment,** دەنێردرێت بۆ نوێنەری كۆمپانیایەك یا ووردەفرۆشێك بە مەرجێك كە شتەكە فرۆشرا پارەكەی بنێردرێتەوە بۆ كۆمپانیاكە

**consignor** (kən-sīn′ẽr, kon′sī-nôr′), *n.* نێرەر: كەسێك یا بەزگایەكی بازرگانی كە شتومەك دەنێرێت بۆ نوێنەرەكەی بۆ فرۆشتن یا هەڵگرتنی.

**consist** (kən-sist′), *v.i.* (١) ( **~ of** )، پێكهاتن؛ پێكهاتن لە؛ پەیدابوون لە: *( Water ~s of hydrogen and oxygen.)*. (٢) ( **~ in** )، بەندبوون لەسەر؛ لەوەدابوون؛ بریتی بوون لە: *( Wisdom does not ~ only in knowing many facts.)* (٣) ( **~ with** )، گونجان لەگەڵ؛ ڕێكەوتن لەگەڵ. (٤) [Archaic]، یەك پێكرتن؛ نووسانن پێكەوە؛ كردن بە یەك.

**consistence** (kən-sis′təns), *n.* = **consistency.**

**consistency** (kən-sis′tən-si), *n.* (١) خۆگرتن (شله)؛ خەستی.
(٢) ڕادەی خەستی یا توندوتۆلی؛ یەك ددانی:
*( This yogurt is of the right ~ .)*
(٣) گونجان لەگەڵ یەکتر؛ ڕێکەوتن؛ یەك نەوایی؛ چوونیەکی:
*( These accounts show no ~ .)*
(٤) بەردەوامی لەسەر ڕێبازێکی دانراوو لەسەر پێکهاتوو؛ نەگۆڕان.
**consistent** (kən-sis′tənt), *adj.* (١) [Rare]، خۆگر؛ توندوتۆل:
*( ~ soil)*
(٢) لەگەڵ گونجاو؛ لەگەڵ ڕێکەوتوو:
*( Overeating is not ~ with good health.)*
(٣) بەردەوام؛ نەگۆڕ: *( ~ behavior)* .
**-consistently** *(adv.).*
**consistory** (kən-sis′tə-ri), *n.* (١) شوێنی کۆبوونەوەی لیژنە یا دادگایەك. (٢) لیژنەیەکی کلێسەیی؛ دادگایەکی کلێسەیی.
(٣) کۆبوونەوەیەکی لیژنە یا دادگایەکی وەها.
**consociate** (kən-sō′shi-it), *adj.* یەك؛ یەککگرتوو.
*n.* هاوبەش.
*v.i. & v.t.* یەککگرتن؛ بوون بە یەك؛ یەك پێکگرتن؛ کردن بە یەك.
**consolation** (kon′sə-lā′shən), *n.* (١) دڵنەوایی‌کردن؛ سەبووری؛ دڵخۆشی دانەوە. (٢) سەرخۆشی؛ سەرخۆشی لێکردن.
(٣) دڵخۆشکەرە (مرۆڤ، شت، ڕووداو)؛ دڵنەواییکەر.
**consolation prize,** پاداشتی دڵخۆشکردن: دەدرێت بە کەسێك کە لە پێشبڕکێ‌یەکدا زۆر باش دەبێت، بەڵام ئەوەندە نا کە بیباتەوە.
**consolatory** (kən-sol′ə-tôr′i, kən-sol′ə-tō′ri), *adj.* تایبەت بە دڵخۆش کردن یا دڵنەوایی کردن؛ خەم ڕەوێن.
**console** (kən-sōl′), *v.t.* دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنەوایی کردن؛ سەرخۆشی لێکردن؛ سەبووری دانەوە.
**console** (kon′sōl), *n.* (١) گۆشە یا سێپایەکی ڕازاوە (کە ڕەفە یا مێزو شتی وەهای لەسەر دەچەسپێنرێت). (٢) مێزێکی جوانی قەد دیوار.
(٣) دۆڵابی رادیۆو تەلەفزیۆن‌و سنووقی قەوان.
(٤) مێزی " ئۆرگان " کە ئامێرێکی مۆسیقایی‌یە لە پیانۆ دەچێت.
(٥) دۆڵابی بەشی چاودێری کردنی ئامێری کارەبایی یا مەکینە.
**console table,** مێزێکی ڕازاوەی نەقشدارە چەسپ دەکرێت لەناو دیوارێکدا یا بەقەد دیوارێکەوە.
**consolidate** (kən-sol′ə-dāt′), *v.t.* (١) کردن بە یەك؛ یەکخستن.
(٢) چەسپاندن؛ بەهێزکردن: *( The government ~d its power.)* .
*v.i.* (١) بوون بە یەك؛ یەککگرتن.
(٢) پتەوبوون؛ بەهێزبوون؛ چەسپین.
**consolidated school,** قوتابخانەی یەککگرتوو: قوتابخانەیەکە کە قوتابی لە گەلێك ناوچە یا گەڕەکی تەنیشت شاری بۆ دێت.
**consolidation** (kən-sol′ə-dā′shən), *n.* (١) یەکێتی؛ یەککگرتن؛ بوون بە یەك. (٢) جێگیربوون؛ چەسپاندن؛ پتەوبوون.
**-consolidator** *(n.).*
**consols** (kon′solz, kən-solz′), *n.pl.* سەنەدی دارایی حوکمڕانی ئینگلتەرە
**consommé** (kon′sə-mā′), *n.* گۆشتاو؛ شۆربای ڕوونی گۆشت یا گۆشت‌و سەوزە (دەپاڵێورێت‌و تەنها ئاوە ڕوونەکەی دەمێنێتەوە).
**consonance** (kon′sə-nəns), *n.* (١) گونجان؛ ڕێکەوتن لەگەڵ یەکدا؛ تەبایی. (٢) گونجانی چەند ئاوازێکی مۆسیقا پێکەوە؛ یەك نەوایی.
**consonancy** (kon′sə-nən-si), *n.* = consonance.
**consonant** (kon′sə-nənt), *adj.* (١) گونجاو؛ یەك نەوا.
(٢) هاودەنگ.
*n.* (١) تیپی نەبزوێن (دەنگناسی)؛ تیپێك کە پەیدا دەبێت بە: (ا) بەربەستن‌و بەرەڵاکردنی هەوا ( p, t, k, b, d, g ) . (ب) بەربەستکردنی هەوا لەلایەکەوە لەکاتێکدا لەلایەکی ترەوە دەرباز دەبێت ( m, n, ŋ, l, r ) .
(ج) بەزۆر پاڵ بە هەواوە نان لە درزێکەوە ( f, v, z, sh, zh, th, h, w ) .
(د) بە هەموو ئەم سێ شێوەیە پێکەوە ( ch, j ) .
(٢) دەنگ یا بڕگەی کەم دەنگ.
-consonantal *(adj.).*
**consort** (kon′sôrt), *n.* (١) هاوبەش؛ ئاوەڵ.
(٢) ژن؛ مێرد؛ ژنی پاشا؛ مێردی شاژن؛ هاوسەر.
(٣) کەشتی‌یەك کە لەگەڵ کەشتی‌یەکی تردا دەڕوات؛ کەشتی هاوڕێ.
(٤) [Obs.]، (ا) هاوڕێ‌یەتی؛ ئاوەڵێتی. (ب) یەکێتی؛ ڕێکەوتن.
(ج) یەك نەوایی؛ گونجانی ئاواز.
*v.i.* (١) لەگەڵدابوون؛ لەگەڵدا هەڵسان‌و دانیشتن؛ برادەرێتی لەگەڵدا کردن.
(٢) لەگەڵدا گونجان؛ لەگەڵدا ڕێکەوتن.
*v.t.* (١) کردن بە یەك؛ یەك پێکگرتن.
(٢) [Obs.]، (ا) لەگەڵدابوون؛ لەگەڵدا چوون.
(ب) ژنهێنان؛ هاوجێ‌یی کردن. (ج) یەك ئاواز درووستکردن.
**consortium** (kən-sôr′shi-əm), *n.* (١) یەکێتی؛ کۆمەڵە؛ ڕێکخراو.
(٢) یەکێتی دارایی: ڕێکەوتنێکە لەنێوان دەزگای دارایی‌و بانقەکانی دوو وڵات یا زیاتردا بۆ یارمەتیدانی وڵاتێکی تر.
(٣) مافی مێردێك لە خۆشەویستی‌و یارمەتیدان‌و لەگەڵدابوونی ژنەکەیدا؛ مافی ژنێك بۆ هەمان شت لە مێردەکەی.
**conspectus** (kən-spek′təs), *n.* (١) چاوپیاخشاندنێکی گشتی بە باسێکدا؛ سەیرکردنێکی سەرپێ‌یی باسێك. (٢) کورتە (باس)؛ پوختە.
**conspicuous** (kən-spik′ū-əs), *adj.* (١) ڕوون؛ ئاشکرا؛ دیار؛ زۆر لەبەرچاو: *( a ~ billboard; a ~ man)* .
(٢) سەرنج ڕاکێش: *( She was ~ for her beauty.)* .
**conspiracy** (kən-spir′ə-si), *n.* (١) پیلان.
(٢) پیلان گێڕان؛ پیلانبازی کردن. (٣) پیلانبازان؛ پیلان گێڕان.
(٤) پێکهاتن‌و هاوکاری کردن (بۆ ئەنجامی خراپ): *( the ~ of events)* .
**conspirator** (kən-spir′ə-tẽr), *n.* پیلانباز؛ پیلانگێڕ.
-conspiratorial *(adj.)*; conspiratory *(adj.).*
**conspire** (kən-spīr′), *v.i.* (١) پیلان گێڕان؛ پیلان دانان.
(٢) هاوکاری کردن‌و یەککگرتن (بۆ هەر مەبەستێك بێت):
*( Events ~d to ruin him.)*
**constable** (kon′stə-b'l, kun′stə-b'l), *n.* (١) کاربەدەستێکی گەورە لە کۆشکی پاشا یا بەگزادەیەکدا (سەدانی ناوەڕاست).
(٢) فەرماندەی قەڵایەکی پاشایی. (٣) پۆلیس (لە ئینگلتەرە)؛ پاسەوان.
(٤) فەرمانبەر یا ئەفسەری ئاسایش.
-constableship *(n.).*
**constabulary** (kən-stab′yoo-ler′i), *n.* (١) ناوچەیەك کە پۆلیسێك لێپرسراوی بێت. (٢) هەموو پۆلیسی ناوچەیەك یا شارێك.
(٣) هێزێکی پۆلیس‌و چەکدار. (٤) پۆلیس.
*adj.* تایبەتی بە پۆلیس‌و ئەو ناوچانەی لێپرسراویانن.
**constancy** (kon′stən-si), *n.* بەردەوامی؛ نەگۆڕان: (ا) ڕا نەگۆڕین؛ لەسەر هەمان ڕێباز مانەوە. (ب) بەردەوام بوون لە خۆشەویستی یا دڵسۆزیدا (بەتایبەتی لەنێوان یاراندا)؛ وەفا. (ج) چوونیەکی؛ ڕێك‌وپێکی.
**constant** (kon′stənt), *adj.* (١) بەردەوام؛ نەگۆڕ: (ا) ڕا نەگۆڕ؛ لە ڕێ لانەدەر. (ب) دڵسۆز؛ بە وەفا؛ خۆشەویستی‌یەکەی بەردەوامە.
(ج) چوونیەك؛ دڵ نەگۆڕ؛ وەك خۆی دەمێنێتەوە.
(٢) بەردەوام؛ هەمیشەیی؛ سەروەر: *( ~ interruptions)* .
*n.* (١) شتێکی نەگۆڕ؛ شتێك کە هەمیشە هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە
(٢) هەند یا ژمارەی نەگۆڕ (بیرکاری، فیزیا).
**constantly** (kon′stənt-li), *adv.* (١) هەمیشە؛ بەردەوام.
(٢) پەیتا پەیتا؛ زۆر جار؛ جار لەدوای جار.
**constellate** (kon′stə-lāt′), *v.t.* کۆکردنەوە؛ خڕکردنەوە.
*v.i.* کۆبوونەوە؛ گردبوونەوە؛ خڕبوونەوە.
**constellation** (kon′stə-lā′shən), *n.* (١) کۆنەستێرە؛ حەوتەوانە.

(٢) شوێنی ئەستێرە لەکاتی لەدایکبوونی کەسێکدا (ئەستێرەوانی)؛ بورج.
(٣) کۆمەڵێك شتی سەرنج ڕاکێش: *( a ~ of beautiful women)* .

**consternate** (kon′stēr-nāt′), ***v.t.*** ترساندن· تۆقاندن؛ تووشی مەترسی کردن· واق وڕماندن.

**consternation** (kon′stēr-nā′shən), ***n.*** ترس؛ تۆقان؛ مەترسی؛ واق وڕمان.

**constipate** (kon′stə-pāt′), ***v.t.*** (١) تووشی قەبزی کردن؛ گرفت پێکردن؛ تووشی گیراوی کردن. (٢) [.Obs]، پەستنەوە.

-constipated *(adj.)*.

**constipation** (kon′stə-pā′shən), ***n.*** (١) ناڕەوانی؛ قەبزی.
(٢) [.Obs]، پەستنەوە.

**constituency** (kən-stich′ōō-ən-si), ***n.*** (١) دەنگدەرانی ناوچەی هەڵبژاردن؛ هەموو دانیشتووانی ناوچەیەکی هەڵبژاردن.
(٢) ناوچەی هەڵبژاردن (٣) کڕیارەکان؛ ئاشناکان؛ پاڵپشتیکەران.

**constituent** (kən-stich′ōō-ənt), ***adj.*** (١) بەشێکی بنچینەیی (لە- پێکهێنانی شتێکدا)؛ بەشێکی پێکهێنەر: *( a ~ part)* .
(٢) دەنگدەر؛ مافی دەنگدانی هەیە.
(٣) دانەر (ئەنجوومەن)؛ بنچینە دانەر (ئەنجوومەن)؛ دەسەڵاتی دانان یا پیاچوونەوەی دەستوورێکی دراوەتێ: *( a ~ assembly)* .

***n.*** (١) دەنگدەر؛ هەڵبژێرەر؛ دانیشتووی ناوچەیەکی هەڵبژاردن.
(٢) دانەری کەسێك لە جێی خۆ؛ کڕیار؛ پاڵپشتیکەر.
(٣) بەشێکی پێکهێنەر.
(٤) دانەیەك لە بەشەکانی ڕستەیەك (زمانەوانی).

**constitute** (kon′stə-tōōt′, kon′stə-tūt′), ***v.t.*** (١) دامەزراندن؛ دانان (یاسا، فەرمانڕەوایی، دەزگا).
(٢) دیاری کردن؛ دانان: *( The students ~d him their spokesman.)* .
(٣) پێکهێنان: *( Twelve people ~ a jury.)* .
(٤) لە کەرەسە یا شت پێکهێنان.

**constitution** (kon′stə-tōō′shən, kon′stə-tū′shən), ***n.*** (١) دامەزراندن؛ دانان؛ پێکهێنان. (٢) پێکهاتن. (٣) شێوەی پێکهێنان یا پێکهاتن.
(٤) شێوەی پێکهاتنی کەسێك (لەش و مێشك)؛ تەندروستی لەش و مێشك:
*( a man of strong ~ )*
(٥) دەستوور: یاسا بنچینەییەکان (وڵات، کۆمەڵە، ڕێکخراو، دەزگا... هتد).
(٦) بڕوانامە یا قەواڵەیەك کە ئەم دەستوورەی تێدا نووسراوە.
(٧) [-C]، دەستووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**constitutional**(kon′stə-tōō′shən-'l, kon′stə-tū′shən-'l), ***adj.*** (١) بنچینەیی؛ بناغەیی.
(٢) بنچینەییە لە لەشدا: *( a ~ weakness)* .
(٣) بۆ تەندروستی باشە.
(٤) تایبەتی بە دەستوور؛ بەپێی دەستوور؛ دەستووری: *( ~ rights)* .
(٥) پەیڕەوی دەستوور دەکات.

***n.*** [Colloq.], وەرزشێك کە بۆ تەندروستی باش بێت (بەتایبەتی پیاسە یا بە پێ ڕۆیشتن).

**constitutionalism** (kon′stə-tōō′shən-'l-iz'm, kon′stə-tū′shən-'l-iz'm), ***n.*** (١) فەرمانڕەوایی بەپێی دەستوور.
(٢) پەیڕەوی کردنی دەستوور.

**constitutionalist** (kon′stə-tōō′shən-'l-ist, kon′stə-tū′shən-'l-ist), ***n.*** (١) دەستوورخواز؛ پەیڕەویکەری دەستوور.
(٢) دەستوورناس؛ پسپۆری دەستوور و پەیڕەوی کردنی دەستوور.

**constitutionality** (kon′stə-too′shən-al′ə-ti, kon′stə-tū′shən-al′ə-ti), ***n.*** بەپێی دەستوور بوون؛ دەستووریتی هەڵوێست، کردەوە، یا ڕووداوێك.

**constitutionally** (kon′stə-tōō′shən-'l-i, kon′stə-tū′shən-'l-i), ***adv.*** (١) لەڕووی تەندروستییەوە؛ چۆنێتی پێکهاتنی لەش و مێشك: *( He is ~ frail.)* .

(٢) بەپێی دەستوور؛ بەشێوەیەکی دەستووری:
*( Social change can be brought about ~ .)*

**constitutional monarchy,** ڕژێمی پاشایەتی دەستووری.

**constitutive** (kon′stə-tōō′tiv, kon′stə-tū′tiv), ***adj.*** (١) زۆر گرنگ بۆ پێکهێنانی شتێك؛ بنچینەیی؛ بناغەیی: *( a ~ part)* .
(٢) دانەر؛ بنچینە دانەر؛ دەسەڵاتی دانان و کردنی هەیە.

**constrain** (kən-strān′), ***v.t.*** (١) جڵەوگرتن؛ سنوور بۆ دانان؛ ڕاگرتن.
(٢) زۆرلێکردن؛ ناچارکردن: *( He was ~ed to agree.)* .

**constrained** (kən-strānd′), ***adj.*** (١) جڵەوگیراو؛ بەستراوە؛ گیراو.
(٢) بە زۆر کراو؛ ناچاری؛ درۆ: *( a ~ laugh)* .

**constraint** (kən-strānt′), ***n.*** (١) جڵەوگرتن؛ سنوور دانان؛ بەستنەوە؛ بەندکراوی. (٢) زۆرداریکی؛ ناچاری.
(٣) پێ پەست کردن یا کردن بە ژێرەوەی هەست و هەوەسی سرووشتی؛ ڕەووشتی درۆ و ناسرووشتی. (٤) سنوور؛ جڵەو.

**constrict** (kən-strikt′), ***v.t.*** هێنانەوەیەك؛ گوشین؛ بچووك کردنەوە؛ تەنگەتاوکردن.

-constrictive *(adj.)*; constrictively *(adv.)*.

**constriction** (kən-strik′shən), ***n.*** (١) (ا) هێنانەوەیەك؛ گوشین؛ بچووك کردنەوە؛ قەتیس کردن. (ب) هاتنەوەیەك؛ بچووك بوونەوە؛ قەتیس بوون.
(٢) تەنگەتاوبوون؛ تەنگەنەفەس بوون؛ هەست بەستنەوە؛ سنوورداری.
(٣) بەستەرەوە؛ سنوور بۆ دانەر؛ کۆسپ.

**constrictor** (kən-strik′tēr), ***n.*** (١) بەستەرەوە؛ کۆسپ؛ ڕێگر.
(٢) ماسولکەی گوشێنەر؛ ماسولکەی کرژبوو یا چووەوەیەك.
(٣) ماری گوشێنەر: مارێکە نێچیرەکەی دەکوژێت بە خۆپێچان لە لەشیەوە و گوشینی هەتا هەناسەی لەبەر دەبڕێت.

**constringe** (kən-strinj′), ***v.t.*** هێنانەوەیەك؛ کرژکردن؛ گرتن.

**constringency** (kən-strin′jən-si), ***n.*** هاتنەوەیەك؛ کرژبوون؛ گیران.

-constringent *(adj.)*.

**construct** (kən-strukt′), ***v.t.*** (١) دروستکردن (پرد، خانوو)؛ داڕشتن (ڕستە، ووشە)؛ دامەزراندن. (٢) ڕێکخستن؛ ڕێك و پێك کردن؛ دانان (بیردۆز). (٣) دروستکردنی شێوەیەکی ئەندازەیی بەگوێرەی ویستراو (بیرکاری).

***n.*** (١) شتێکی دروستکراو یا داڕێژراو (بیردۆز، بیروباوەڕ، ڕێباز... هتد).
(٢) پارچە نووسراوێك بەتایبەتی کە لە کۆمەڵێك دەستەواژە پێك هاتبێت (زمانەوانی).

**construction** (kən-struk′shən), ***n.*** (١) داڕشتن (ووشە، ڕستە، بیردۆز)؛ دامەزراندن؛ دروستکردن.
(٢) چۆنێتی دروستکردن یا داڕشتن (خانووسازی، زمانەوانی).
(٣) شتێکی دروستکراو (خانوو).
(٤) لێکدانەوە (ووتە، بیر):
*( Don't put the wrong ~ on my statement.)*
(٥) داڕشتنی ڕستە یا سارستەیەك بە ووشە؛ ڕێکخستن و پەیوەندی ووشە لە ڕستە یا سارستەیەکدا؛ پەیوەندی نێوان ووشەکانی ناو ڕستە.

-constructional *(adj.)*; constructionally *(adv.)*.

**constructionist** (kən-struk′shən-ist), ***n.*** لێکدەرەوەی یاسا یا دەستوور.

**constructive** (kən-struk′tiv), ***adj.*** (١) سوودبەخش؛ بەسوود؛ مەبەستی چاککردنە نەك ڕووخاندن: *( ~ criticism)* .
(٢) تایبەتی بە داڕشتن و دروستکردن یا شتێکی دروستکراو.
(٣) ڕاستەوخۆ دەرنەبڕاوە، بەڵکو لە لێکدانەوەدا دەردەکەوێت (دادگەری):
*( ~ crime)*

**constructor** (kən-struk′tēr), ***n.*** دروستکەر؛ سەرکار (خانوو).

**construe** (kən-strōō′), ***v.t.*** (١) شیکردنەوەی ڕستە (ڕێزمان).
(٢) لێکدانەوە (بیروباوەڕ، ڕووداو، کردەوە، هەڵوێست):

*( Her sudden departure was ~d as an insult.)*

(۲) وەرگێران (لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر).

*v.i.* (۱) شیکردنەوەی ڕستە (ڕێزمان).

(۲) لێکدانەوە (بیروباوەڕ، هەڵوێست، بیردۆز، کردەوە، ڕووداو).

**consubstantial** (kon′səb-stan′shəl), *adj.* هاوسرووشت؛ هاوناوکرۆک

**consul** (kon′s'l), *n.* (۱) یەکێك لە دوو فەرماندە سەرەکییەکەی ڕۆمای کۆن. (۲) یەکێك لە سێ فەرماندە سەرەکییەکەی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی ۱۷۹۹-۱۸۰٤. (۳) قونسوڵ؛ نوێنەری وڵاتێك لە یەکێك لە شارەکانی وڵاتێکی تردا؛ شابەندەر.

**consular** (kon′s'l-ēr, kon′syoo-lēr), *adj.* شابەندەری؛ قونسوڵی؛ تایبەتی بە شابەندەرو کارو دەسەڵاتی.

**consular agent,** جێگری قونسوڵ یا شابەندەر لە شارێکدا کە بایەخی بازرگانی کەم بێت.

**consulate** (kon′s'l-it, kon′syoo-lit), *n.* (۱) شابەندەرخانە؛ فەرمانگەی شابەندەر. (۲) پلەوپایەو کارو دەسەڵاتی شابەندەر.

(۳) ماوەی مانەوەی شابەندەر لەسەر کار.

(٤) فەرمانڕەوایی بە شابەندەر (ڕۆمای کۆن و فەرەنسا دوای شۆڕشی فەرەنسی).

**the Consulate,** فەرمانڕەوایی شابەندەری فەرەنسا ۱۷۹۹-۱۸۰٤.

**consul general,** قونسوڵی گشتی؛ شابەندەری گشتی: لە شارێکی سەرەکی وڵاتێکی بێگانەدا دادەنیشێت و سەرەوکاری چەند شابەندەرێکی شارە بچووکەکانی دەوروپشتی دەکات.

**consulship** (kon′s'l-ship′), *n.* (۱) قونسوڵێتی؛ پلەوپایەو کارو دەسەڵاتی شابەندەر. (۲) ماوەی مانەوەی قونسوڵ لەسەر کار.

**consult** (kən-sult′), *v.i.* ڕاوێژکردن؛ پرس پێکردن.

*v.t.* (۱) ڕاوێژ پێکردن؛ پرس پێکردن؛ ڕاوێژ لەگەڵ کردن؛ سەیرکردن بۆ دۆزینەوەی ئەو شتەی پێویستە (پەڕتووك، فەرهەنگ، نەخشە):

*( to ~ one's lawyer, a doctor, a map, a dictionary, etc.)*

(۲) بایەخ پێدان؛ نەخستنە پشت گوێ:

*( C~ your own wishes in the matter.)*

*n.* [Obs.], ڕاوێژ؛ ڕاوێژکردن

**consultant** (kən-sul′t'nt), *n.* (۱) ڕاوێژیار؛ ڕاوێژپێکراو.

(۲) ڕاوێژکار.

**consultation** (kon′s'l-tā′shən), *n.* (۱) ڕاوێژ؛ ڕاوێژکردن؛ پرس پێکردن. (۲) کۆبوونەوەیەك بۆ لێکۆڵینەوەو ڕاوێژکردن و نەخشەدانان.

**consultative** (kən-sul′tə-tiv), *adj.* تایبەتی بە ڕاوێژکردن و پرس پێکردن؛ ڕاوێژکاری: *( His function was ~ .)* .

**consumable** (kən-sōōm′ə-b'l, kən-sūm′ə-b'l), *adj.* بەکار-دەهێنرێت (شتومەك، کەلوپەل، خواردەمەنی).

*n.* شتێك کە بەکاربهێنرێت.

**consume** (kən-sōōm′, kən-sūm′), *v.t.* (۱) فەوتاندن؛ لەناوبردن؛ ماندووکردن؛ سووتاندن (مەجاز): *( This project will ~ you.)* .

(۲) تەواوکردن؛ هیچ نەهێشتنەوە؛ ماشینەوە؛ خواردن؛ خواردنەوە.

(۳) بەفیڕۆدان (پارە، کات، ووزە)؛ کارکردن (ووزە)؛ بەکارهێنان.

*v.i.* لەناوچوون؛ نەمان.

**consumed with,** گرفتار بووە بە (دڵ پیسی، خەموخەفەت، حەزێك)؛ بیرو هۆشی ناوەتە سەر شتێك.

**consumer** (kən-sōōm′ēr, kən-sūm′ēr), *n.* (۱) فەوتێنەر؛ لەناوبەر؛ بەفیڕۆدەر؛ بەکارهێنەر. (۲) بەرخۆر؛ کڕیار.

**consumers' goods,** شتومەکی بەکارهێنان؛ شتومەکی فرۆشتن (وەك خواردەمەنی و جلوبەرگ کە مرۆڤ دەیکڕێت و بەکاری دەهێنێت)؛ فرۆتەنی.

**consumerism** (kən-sōōm′ēr-iz'm, kən-sūm′ēr-iz'm), *n.* پاراستنی مافی کڕیار.

**consummate** (kən-sum′it), *v.t.* (۱) هێنانەدی؛ جێبەجێکردن.

(۲) بوون بە زاوا؛ درووست بوون: *( They ~d their marriage.)* .

*adj.* ئەوپەڕ؛ زۆر کارامە؛ بێ هاوتا: *( a ~ liar; a ~ skill)* .

**consummation** (kon′sə-mā′shən), *n.* (۱) هێنانەدی؛ هاتنەدی؛ هێنانە بەرهەم؛ هاتنە بەرهەم. (۲) ئەنجام؛ کۆتایی؛ دوایی.

(۳) بوون بە زاوا؛ جووت بوون.

-**consummative** *(adj.)*; **consummator** *(n.)*.

**consumption** (kən-sump′shən), *n.* (۱) بەکارهێنان؛ خواردن و تەواوکردن؛ نەهێشتن؛ تەواوکردن. (۲) دەردەباریکە؛ سیل.

(۳) (ا) بەکاربردن یا بەکارهێنانی شتومەك لەلایەن کڕیارانەوە (ئابووری ناسی)

(ب) هەند یا کۆی ئەو شتومەکەی مرۆڤ بەکاری دەهێنێ.

**consumptive** (kən-sump′tiv), *adj.* (۱) بەکارهێنەر؛ فەوتێنەر؛ لەناوبەر؛ بەفیڕۆدەر. (۲) تایبەتی بە فرۆتەنی کە بەکارهێنەر دەیکڕێت (ئابووری ناسی). (۳) (ا) تایبەتی بە دەردەباریکە یا سیل.

(ب) سیلاوی؛ لەوانەیە تووشی سیل ببێت.

*n.* کەسێکی سیلاوی؛ سیلاوی.

**contact** (kon′takt), *n.* (۱) لێکەوتن؛ بەرکەوتن؛ لێکدان؛ لێکخشان.

(۲) پەیوەندی؛ پەیوەندی کردن؛ تووش بوون؛ ناسین:

*( He made some ~s with important people.)*

(۳) کەسێك کە پەیوەندی باش بێت، واتە جێی بڕوا بێت و یارمەتیت بدات:

*( He is a good ~ to have.)*

(٤) کەسێکی درماوی یا نەخۆش.

(٥) (*pl.*)، [Colloq.]، چاویلکەی پێوەنووس: چاویلکەیەکی زۆر بچووکە دەکرێتە چاوو بە چاوەوە دەنووسێت.

(٦) (ا) بەیەك گەیاندنی دوو کارەباکێش. (ب) ئامێری ئەم بەیەك گەیاندنە.

*v.t.* (۱) لێکخشاندن؛ لێکدان؛ بەیەك گەیاندن.

(۲) پەیوەندی کردن؛ پەیوەندی لەگەڵ بەستن.

*v.i.* پەیوەندی لەگەڵدابوون؛ تووش بوون؛ ناسین.

**contact flying,** *Also* **contact flight,** فڕینی نزم بە ڕادەیەك کە فڕۆکەوان ڕێی خۆی بدۆزێتەوە بەهۆی شتی سەر زەوییەوە وەك ڕووبارو شاخ و خانوو... هتد.

**contact lenses,** *Also* **contact lens,** چاویلکەی پێوەنووس: چاویلکەیەکی زۆر بچووکە دەکرێتە ناو چاوو بە چاوەوە دەنووسێت.

**contagion** (kən-tā′jən), *n.* (۱) تووش بوون یا گرتنی نەخۆشی لە کەسێکی ترەوە؛ بڵاوبوونەوە یا تەشەنەکردنی نەخۆشی.

(۲) درم؛ نەخۆشییەك کە مرۆڤ لەیەکترییەوە بیگرێت؛ نەخۆشی تێپەڕ.

(۳) هۆی تێپەڕبوون یا تەشەنەکردنی نەخۆشی. (٤) ژەهر.

(٥) بەخێرایی بڵاوبوونەوەی نەریت، خوو، باو یا مۆدەیەك.

(٦) کارتێکەرێکی خراپ یا ڕەووشت تێکدەرێك کە زوو بڵاودەبێتەوەو تەشەنە دەکات: *( Racial hatred is a ~ .)* .

**contagious** (kən-tā′jəs), *adj.* (۱) درم؛ تێپەڕ (نەخۆشی)؛ بەتەشەنە: *( a ~ disease)* .

(۲) هەڵگری نەخۆشی تێپەڕ یا هۆی تێپەڕبوونەکە.

(۳) تەشەنەکەر (خوو، نەریت، باو، مۆدە): *( a ~ laughter)* .

**contain** (kən-tān′), *v.t.* (۱) تێدابوون:

*( What does this box ~ ?; The book ~s a good deal of useful information.)*

(۲) گرتن؛ توانای گرتن هەبوون؛ ئەوەندەبوون:

*( A gallon ~s four quarts)*

(۳) بەربەست کردن؛ وەستاندن؛ ڕاگرتن؛ سنوور بۆ دانان.

(٤) دابینکردن؛ خۆگرتن؛ ڕاگیرکردن (خۆ، هەست):

*( Can you ~ your enthusiasm?)*

(٥) توانای دابەش بوون بەسەر ژمارەیەك یا چەند ژمارەیەکدا بەبێ ئەوەی هیچی بمێنێتەوە (بیرکاری): *( 12 ~s 2, 3, 4 and 6 .)* .

**container** (kən-tān′ēr), *n.* دەفر؛ شتێك کە شتی تێدا بێت یا تێی بکرێت (سندووق، قوتوو، قاپ، شووشە، تەنەکە... هتد).

**containment** (kən-tān′mənt), *n.* بەربەست کردن (بیروباوەڕێکی

ڕامیاری، ئاینی یا نەتەوەیی، یا وولاتێك كە مەترسی لێ بكرێت)؛ وەستاندن؛ ڕاگرتن

**contaminant** (kən-tam′ə-nənt), ***n.*** پیسكەر (مرۆڤ، میكرۆب، ماددە)

**contaminate** (kən-tam′ə-nāt′), ***v.t.*** پیس كردن بە میكرۆب یا شتی تر (ئاو، خواردن و خواردنەوە، هەوا)؛ خراپ كردن (ڕەووشت)؛ تووش كردن (نەخۆشی).

**contamination** (kən-tam′ə-nā′shən), ***n.*** (١) پیس كردن؛ پیس بوون؛ خراپ بوون. (٢) پیسكەر؛ پیسی.

**contaminator** (kən-tam′ə-nā′tēr), ***n.*** پیسكەر (مرۆڤ، ماددە، میكرۆب)؛ تووشكەر (مرۆڤی نەخۆش یا بەدڕەفتار)

**conte** (kōnt), ***n.*** (١) چیرۆكێكی پڕ لە ڕووداوی سەرئاسا. (٢) چیرۆك؛ حیكایەت.

**contemn** (kən-tem′), ***v.t.*** بە سووك سەیركردن.

**-contemner** ***(n.).***

**contemplate** (kon′təm-plāt′), ***v.t.*** (١) بەووردی سەیركردن؛ ووردبوونەوە. (٢) بیرلێكردنەوە؛ لێكۆڵینەوە.
(٣) نیازبوون؛ بەتەمابوون: ***( He is ~ing marriage.)*** .
(٤) چاوەڕوان بوون؛ بینین (لە دواڕۆژدا): ***( I don't ~ any problem.)*** .
***v.i.*** بیركردنەوە

**-contemplator** ***(n.).***

**contemplation** (kon′təm-plā′shən), ***n.*** (١) لێكۆڵینەوە؛ بیركردنەوە (٢) نیاز؛ نیازبوون؛ بەتەمابوون. (٣) ڕابینین؛ چاوەڕوان بوون.

**contemplative** (kon′təm-plā′tiv), ***adj.*** بیركەرەوە؛ تایبەتی بە بیركردنەوە و سۆفیێتی: ***( a ~ life)*** .
***n.*** (١) كەسێكی بیركەرەوە؛ كەسێك كە زۆربەی كاتی بە بیركردنەوە بەرێتە سەر.
(٢) ئەندامی كۆمەڵێكی سۆفیگەری؛ ئەندامی كۆمەڵێكی ئاینی كە بیركردنەوە و سۆفی گەرێتی ڕێبازێتی.

**-contemplatively** ***(adv.)***; **contemplativeness** ***(n.).***

**contemporaneity** (kən-tem′pēr-ə-nē′ə-ti), ***n.*** هاوچەرخی؛ هاوسەردەمی؛ هەوكاتی؛ هاودەمی.

**contemporaneous** (kən-tem′pə-rā′ni-əs), ***adj.*** هاوچەرخ؛ هاوسەردەم؛ هاوكات: ***( ~ events)*** .

**contemporary** (kən-tem′pə-rer′i), ***adj.*** (١) هاوچەرخ. (٢) هاوتەمەن. (٣) نوێ؛ تازە؛ سەردەم: ***( ~ art)*** .
***n.*** (١) (*pl.*) هاوتەمەن: ***( We are ~ies)*** .
(٢) كەسێك كە هەڵوێست و بیروباوەڕی نوێ بێت و لەگەڵ ئەم چەرخەدا بگونجێت.
**contemporary with,** هاوچەرخ؛ هاوسەردەم؛ هاوتەمەن.

**contemporize** (kən-tem′pə-rīz′), ***v.t. & v.i.*** هاوچەرخ كردن؛ هاوچەرخ بوون

**contempt** (kən-tempt′), ***n.*** (١) بە سووك سەیركردن؛ ڕق لێ بوونەوە؛ قێزماتنەوە ***( We feel ~ for a liar.; to have ~ for somebody)*** .
(٢) سووكی ***( He fell into ~ as a result of his foolish act.)*** .
(٣) ڕێز نەمان؛ ڕێز نەگرتن: ***( Familiarity breeds ~ .)*** .
(٤) هەڵگەڕانەوە؛ بێ ڕێزی پیشاندان (بەتایبەتی بۆ دادگا یا پەرلەمان)؛ سەركێشی كردن: ***( ~ of court; ~ of congress)*** .

**contemptible** (kən-temp′tə-b'l), ***adj.*** پیس و بۆگەن (مرۆڤ، كردەوە، ڕەفتار)؛ پیس؛ بۆگەن؛ خوێڕی؛ سووك؛ بێ نرخ؛ بە سووك سەیركراو.

**contemptuous** (kən-temp′chōō-əs), ***adj.*** بە سووك سەیركەر؛ سووك؛ سووكانە: ***( She gave him a ~ look.)*** .

**contend** (kən-tend′), ***v.i.*** (١) تێكۆشان (جەنگ)؛ خەبات كردن؛ شەڕكردن ***( Napoleon's troops ~ed with the armies of Europe at Waterloo.)***
(٢) خەبات كردن؛ هەوڵدان؛ بەرەنگاربوون؛ ڕووبەڕوو وەستان.
(٣) پێشبڕكێ كردن؛ ملەملێ كردن: ***( He will ~ for the prize.)*** .
***v.t.*** سووربوون لەسەر (ڕا، بیروڕا، هەڵوێست)؛ دووپاتكردنەوەی هەڵوێستێك ئەگەرچی خەڵك هەڵوێستیان پێچەوانە بێت: ***( We ~ that he is guilty.)***

**-contender** ***(n.).***

**content** (kən-tent′), ***adj.*** (١) بەرچاوتێر؛ پڕ ئاسوودە. (٢) ڕازی؛ قایل.
***v.t.*** ڕازی كردن؛ ڕازی بوون؛ قایل بوون: ***( C ~ yourself with reading about it.)***
***n.*** (١) بەرچاوتێری؛ قایلی.
(٢) [British]، دەنگدانی " بەڵێ " لە ئەنجوومەنی لۆردەكان لە پەرلەمانی ئینگلیزیدا.

**content** (kon′tent), ***n.*** (١) (*pl.*)، (ا) ئەو شتەی لە دەفرێكدایە (وەك: سندووق، شووشە، مەنجەڵ، قاپ... هتد): ***( the ~ of a box)*** .
(ب) ناوەڕۆك (پەڕتووك)؛ ناوناخن: ***( table of ~ )*** .
(٢) ناوەڕۆك؛ مانا؛ مەبەست: ***( The ~ of a poem is distinguished from its form.)***
(٣) فراوانی؛ چەند گرتن؛ شوێنی چەند تیابوونەوە.
(٤) قەبارە؛ قەوارە.
(٥) ڕێژە یا چەند تێدابوونی ماددەیەك لە شتێكی ئارێتەدا.

**contented** (kən-ten′tid), ***adj.*** پڕ ئاسوودە؛ بەرچاوتێر؛ قایل.

**contention** (kən-ten′shən), ***n.*** (١) شەڕەقسە؛ مشتومڕ؛ ناكۆكی.
(٢) تێكۆشان؛ هەوڵدان (بۆ بردنەوەی ملەملێیەك)؛ خەبات.
(٣) لەسەر سووربوونی ڕایەك یا هەڵوێستێك لە مشتومڕێكدا.
**bone of contention,** هۆی ناكۆكی؛ ئەو شتەی ناكۆكی لەسەرە.

**contentious** (kən-ten′shəs), ***adj.*** (١) حەز لە مشتومڕكەر؛ حەز لە شەڕەقسەكەر؛ شەڕانی. (٢) مشتومڕی (مەسەلە، باس)؛ تایبەتی بە ناكۆكی یا هۆی ناكۆكییەك.

**contentment** (kən-tent′mənt), ***n.*** پڕ ئاسوودەیی؛ قایلی.

**conterminous** (kən-tūr′mi-nəs), ***adj.*** (١) هاوسنوور. (٢) لەناو هەمان سنووردان.

**contest** (kən-test′), ***v.t.*** (١) ناڕەزایی دەربڕین دەربارەی شتێك؛ هەوڵی بەدرۆخستنەوە دان؛ بەربەرەكانی كردن: ***( They will ~ the results of the election.)***
(٢) شەڕ لەسەر كردن؛ خەبات بۆ كردن (زەوی‌وزار، بنكەی سوپایی).
***v.i.*** تێكۆشان؛ خەبات كردن دژی؛ خەبات كردن لەگەڵ.
***n.*** (١) ناكۆكی؛ دووبەرەكی؛ شەڕ. (٢) شەڕەقسە؛ مشتومڕ.
(٣) پێشبڕكێ؛ ملەملێ؛ بۆڕبۆڕێن.

**-contestable** ***(adj.)***; **contestation** ***(n.).***

**contestant** (kən-tes′tənt), ***n.*** (١) پێشبڕكێكەر؛ ملەملێكەر.
(٢) تانووت لێدەر (ئەنجامی هەڵبژاردن، وەسیەت، بڕیاری لیژنە)؛ خەباتكەر دژی هەڵوێستێكی بە ناڕەوا دانراو؛ ناڕەزایی دەربڕ.

**context** (kon′tekst), ***n.*** (١) میانە؛ چوارچێوە (ووتە، ڕستە، نووسراو)؛ دەق (ووتە، نووسراو): ***( It is unfair to quote this remark out of its ~ .)***
(٢) ڕابوردوو، بنچینە و بارودۆخی ڕووداوێك.

**-contextual** ***(adj.).***

**contexture** (kən-teks′chēr, kon-teks′chēr), ***n.*** (١) چنین؛ پێكەوەنان؛ یەكخستن؛ كۆكردنەوە؛ هەڵبەستن؛ هۆنینەوە.
(٢) چنراوێك؛ پارچەیەك قوماش یا كوتاڵ؛ شتێكی هەڵبەستراو.
(٣) چۆنێتی چنین، هەڵبەستن، هۆنینەوە یا پێكەوەنانی شتێك.

**contiguity** (kon′ti-gū′ə-ti), ***n.*** (١) نزیكی؛ لێكەوتن؛ بەركەوتن. (٢) [Rare]، زنجیرە.

**contiguous** (kən-tig′ū-əs), ***adj.*** (١) لەیەككەوتوو؛ هاوسنوور. (٢) نزیك؛ بەتەنیشت یەكەوە.

**continence** (kon′tə-nəns), ***n.*** *Also* **continency,** (١) خۆڕاگرتن؛ دان بەخۆدا گرتن. (٢) خۆڕاگرتن (جووت بوون)؛ خۆ دوور گرتن؛ گان نەكردن.

**continent** (kon′tə-nənt), *adj.* (١) خۆڕاگر؛ میانڕەو.
(٢) خۆ دوور گر (جووت بوون).

**continent** (kon′tə-nənt), *n.* (١) کیشوەر
(٢) [Rare]، کۆسپ؛ جڵەو؛ شتێکی ڕێگر یا دابینکەر.
**the Continent,** ئەورووپا جگە لە ئینگلتەرەو ئێرلەندە.

**continental** (kon′tə-nen′t'l), *adj.* (١) کیشوەری؛ تایبەتی بە کیشوەرێك. (٢) [C-]، ئەورووپی؛ تایبەتی بە ئەورووپا.
(٣) [C-]، تایبەتی بە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەکاتی شۆڕشی ئەمەریکادا: *( C~ Congress)*.
*n.* (١) [C-] ، ئەورووپایی؛ دانیشتوویەکی کیشوەری ئەورووپا.
(٢) [C-]، سەربازێکی ئەمەریکی لەکاتی شۆڕشی ئەمەریکادا.
(٣) پارەیەکی کاغەز بوو کە لەکاتی شۆڕشی ئەمەریکادا دەربەچوو پاشان نرخی نەما دوای شۆڕشەکە، لەبەرئەوە دەووترێ: **" not worth a continental "** واتە " بێ نرخە "

**continental code,** شفرەی " مۆرس " ی جیهانی.

**continental divide,** (١) لووتکەی زنجیرە شاخێکی کیشوەری کە ڕووبارو ئاوی کیشوەرێك بەش دەکات بە دوو بەشەوەو هەریەکەیان بە دیوێکدا دەڕۆن؛ ئاوەڕێژ. (٢) [C- D-]، لووتکەی زنجیرە شاخی " ڕۆکی " ئەمەریکای باکوور کە ڕووبارەکان بەش دەکات هەندێکیان بەرەو دەریای " ئەتڵانتیك " و هەندێکیان بەرەو دەریای " پاسفیك " دەکشێن.

**continental shelf,** بەشی تەنکاوی دەریا لە قەراغەکانی دەریادا.

**contingence** (kən-tin′jəns), *n.* (١) لێکەوتن؛ بەریەك کەوتن.
(٢) **contingency**

**contingency** (kən-tin′jən-si), *n.* (١) (ا) لەوانەبوونی ڕوودانێك؛ بۆ هەبوونی ڕوودانی شتێك. (ب) ناکاوی؛ ناکاوی دواڕۆژ:
*( We must be ready for any ~ .; They have made ~ plans.)*
(٢) ڕێکەوت؛ مسۆگەر نەبوون.
(٣) مەرجی؛ دەکەوێتە سەر شتێکی تر.

**contingent** (kən-tin′jənt), *adj.* (١) لەوانەیە؛ بۆی هەیە ڕووبدات.
(٢) ڕێکەوت (٣) مەرجی؛ دەکەوێتە سەر شتێکی تر.
(٤) [Archaic]، لەیەك دەدەن؛ بەریەك دەکەون.
(٥) ڕاستی و چەوتی بەستراوە بە چەند شتێکی ترەوە (بیردۆز).
*n.* (١) ڕێکەوتنێك؛ ڕێکەوت. (٢) بەش یا ڕێژە (لەشکر، کرێکار، نوێنەر).
(٣) (ا) دەستەیەك خەڵك کە نوێنەری وولاتەکەیان بکەن لە ڕووداوێکدا.
(ب) ڕەوەند؛ هاوولاتی وولاتێك کە لە وولاتێکی بێگانەدا دەژی.

**continual** (kən-tin′ū-əl), *adj.* (١) پەیتا پەیتا؛ جار لەدوای جار؛ بە ڕێك وپێکی و زوو زوو ڕوودەدات. (٢) بەردەوام؛ بێ ووچان.

**continually** (kon-tin′ū-əl-i), *adv.* (١) جار لەدوای جار؛ زوو زوو؛ پەیتا پەیتا. (٢) بە بەردەوامی؛ بەبێ وەستان؛ بەبێ ووچان.

**continuance** (kən-tin′ū-əns), *n.* (١) بەردەوامی (ڕوودان، بار، کردار)؛ لەسەر ڕۆیشتن. (٢) ماوە؛ ماوەی بەردەوام بوون (ڕوودان، بار، کردار).
(٣) مانەوە (فرمان، جێگە): *( his ~ in office)* .
(٤) پاشکۆ (چیرۆك)؛ پاشبەند.
(٥) دواخستن بۆ بەروارێکی تر (دادگەری).

**continuant** (kən-tin′ū-ənt), *n.* تیپێکی سادە (نەبزوێن) کە بێژانی دەتوانرێت درێژ بکرێتەوە هەتا هەناسە لەبەر بوێژەکەدا نامێنێ بەبێ ئەوەی چۆنێتی تیپەکە بگۆڕێت، وەك: " f, s, z, m, n, l, r " (دەنگناسی).

**continuation** (kən-tin ′ū-ā′shən), *n.* (١) بەردەوام بوون؛ لەسەر ڕۆیشتن؛ درێژەپێدان. (٢) دەستپێکردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە.
(٣) پاشبەند؛ پاشکۆ.

**continuation school,** قوتابخانەی ئێواران.

**continue** (kən-tin′ū), *v.i.* (١) بەردەوام بوون؛ درێژەکێشان:
*( The war ~d for five years.)*
(٢) مانەوە (لەسەر کار، جێگە... هتد):
*( The chairman ~d in office for another year.)*
(٣) بەردەوام بوون لەسەر؛ کۆڵ نەدان:
*( We ~d to demand our rights.)*
(٤) دەستپێکردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە: *( The speaker ~d.)*
*v.t.* (١) بەردەوام بوون؛ لەسەر ڕۆیشتن؛ درێژەپێدان. (٢) دەستپێکردنەوە.
(٣) هێشتنەوە:
*( The people ~d Roosevelt in office for four terms.)*
(٤) دواخستن بۆ ڕۆژێکی تر (دادگەری).

**continued fraction,** کەرتی بەردەوام (بیرکاری).

**continued proportion,** ڕێژەی بەردەوام: سێ ژمارە یا زیاتر کە ڕێژەی نێوان دوو ژمارەی تەنیشت یەکیان وەك یەك وابێت (٣، ٦، ١٢، ٢٤، ٤٨).

**continued story,** چیرۆکی بەردەوام: کە بە بەش بەش لە گۆڤارێك یا ڕۆژنامەیەکدا بڵاودەکرێتەوە.

**continuity** (kon ′tə-nōō′ə-ti, kon ′tə-nū′ə-ti), *n.* (١) لەسەر- ڕۆیشتن؛ بەردەوام بوون؛ بەردەوامی. (٢) زنجیرە؛ یەك پارچە.
(٣) سیناریۆی فیلمێکی سینەمایی.
(٤) نووسراوەی بەرنامەیەکی رادیۆ یا تەلەفزیۆن.

**continuous** (kən-tin′ū-əs), *adj.* بەردەوام؛ هەمیشە؛ بێ ووچان؛ سەروەر؛ پێکەوە بەستراو.
**-continuously** *(adv.)*.

**continuum** (kən-tin′ū-əm), *n.* نەپچڕاو (شت، هەند، زنجیرە)؛ یەك پارچە؛ شتێکی یەك پارچە.

**contort** (kən-tôrt′), *v.t.* (١) شێواندن؛ تێکدان؛ خواروخێچ کردن:
*( a face ~ed with pain)*
(٢) شێواندن (مانا، ووتە، ووشە)؛ تێکدان؛ گۆڕین (مانا):
*( to ~ a word out of its ordinary meaning)*
*v.i.* خواروخێچ بوون؛ شێوان.

**contortion** (kən-tôr′shən), *n.* (١) شێوە تێکدان (دەموچاو، لەش)؛ شێوان؛ شێوە تێکچوون؛ تێکچوون؛ خواروخێچی.
(٢) شێوە تێکدانێك؛ شێوە تێکچوونێك.

**contortionist** (kən-tôr′shən-ist), *n.* (١) تەنافباز؛ بەهلەوان.
(٢) هونەرمەندێك کە شێوەو مانای ووشە یا وێنە تێکدەدات.

**contour** (kon′toor), *n.* ڕووخسار (شێوە، لەش، زەوی، کۆمەڵە شت، تۆپەڵ)؛ سنوور؛ تارمایی؛ چوارچێوە؛ بەرزو نزمی و گونجانی ئەندامەکانی لەش.
*v.t.* (١) ڕووخسار کێشان؛ چوارچێوە یا نەخشەی گشتی کێشان.
(٢) دروستکردنی ڕێگەیەك بەپێی شێوەی سرووشتی ناوچەکە.

**contour feather,** پەڕی دەرەوەی باڵندەیەك کە شێوەو ڕووخساری باڵندەکە دیاری دەکات.

**contour line,** (١) هێڵێکی نەبینراو کە شوێن و هەمان بەرزایییەکانی سەر زەوی بەیەك دەگەیەنێت. (٢) هێڵی سەر نەخشەیەك کە ئەم شوێن و هەمان بەرزاییانە پیشان بدات.

**contour map,** نەخشەیەکە کە ڕووخساری شوێنێك، واتە بەرزی و نزمی پیشان دەدات.

**contra** (kon′trə), *adv.* بەپێچەوانەوە؛ بەدژەوە.

**contra-** (kon′trə), پێشگرێکە بەمانای: دژ بە؛ دژ؛ بە دژی؛ بەرامبەر.

**contraband** (kon′trə-band ′), *n.* (١) قاچاخچێتی.
(٢) شتومەکی قاچاخ؛ شتێك کە هێنان و بردنی بۆ وولاتێك قەدەغە بێت.
(٣) کەرەسەی قاچاخی جەنگ: ئەو کەرەسەی جەنگەیە کە لە وولاتێکی بێلایەنەوە دەچێت بۆ وولاتێك کە لە جەنگدا بێت لەگەڵ وولاتێکی ترداو بەرامبەرەکەی مافی هەیە بیگرێت و دەستی بەسەردا بگرێت.
(٤) بەندێکی قولەڕەش کە لەکاتی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا ڕای بکردایە یا بە قاچاخی دەربکرایە بۆ بەشی سەرووی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا
*adj.* قاچاخ؛ قەدەغە؛ هێنان و بردنی بۆ وولات قەدەغەیە.

**contrabandist** (kon′trə-ban ′dist), *n.* قاچاخچی.

**contraband of war,** بەندێکی قولەڕەش کە لەکاتی شەڕی ناوخۆی

ئەمەریکادا ڕای بکردایە یا بە قاچاخی دەربکرایە بۆ بەشی سەرووی وولاتە-
یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**contrabass** (kon′trə-bās′), *adj.* دەنگی گڕ؛ دەنگی نزم و پڕ.
*n.* کەمانچەی دەنگ قورس و نزم.

**contraception** (kon′trə-sep′shən), *n.* نەهێشتنی سکپڕبوون؛
ڕێگەگرتن لە سکپڕبوون (هەروەها پێشی دەوترێ: **birth control**).

**contraceptive** (kon′trə-sep′tiv), *adj.* تایبەتی بە ڕێگەگرتن
لە منداڵبوون؛ هی نەهێشتنی سکپڕی.
*n.* هۆی نەهێشتنی سکپڕبوون (دەرمان، ئامێر)؛ ڕێگر لە منداڵبوون.

**contraclockwise** (kon′trə-klok′wīz), *adj. & adv.* - counterclockwise.

**contract** (kon′trakt), *n.* (١) ڕێکەوتن. (٢) بەڵێندان (کار)؛ قۆنتەرات.
(٣) مارەبڕین. (٤) ڕێکەوتننامە؛ بەڵگەنامەیەک کە مەرجەکانی ڕێکەوتنێکی
تێدا نووسرابێت.
*v.t.* (١) ڕێکەوتن؛ بەڵێندان (کار)؛ قۆنتەرات گرتن.
(٢) [Rare]، مارەبڕین؛ مارەکردن.
(٣) گرتن (نەخۆشی)؛ تووش بوون: ( *He ~ed the disease.)* .
(٤) هێنانەوەیەک (کانزا): ( *Cold ~s metals.)* .
(٥) (ا) کرژکردن (ماسولکە). (ب) کرژکردن (دەموچاو).
(٦) کورتکردنەوەی وشە یا دەستەواژەیەک بە لابردنی تیپێک و هەندێک جاریش
بە لێکدانی دوو وشەکە: ( **I'm = I am; can't = cannot** ).
*v.i.* (١) ڕێکەوتن؛ ڕێکەوتن لەسەر. (٢) هاتنەوەیەک (کانزا).
(٣) (ا) کرژبوون (ماسولکە). (ب) کرژبوون (دەموچاو)؛ چرچ و لۆچ بوون.
**-contractibility; contractibleness; contractible** *(n.).*

**contracted** (kən-trak′tid), *adj.* (١) چوونەوەیەک؛ کورتکراوە؛
کرژبوو؛ هەڵقرچاو. (٢) مێشک تەسک. (٣) تووش بوو (نەخۆشی).

**contractile** (kən-trak′t'l, kən-trak′til), *adj.* (١) دەچێتەوەیەک؛
دەهێنرێتەوەیەک؛ دەنوشتێنرێتەوە (باڵی جانەوەر، پێچکەی فڕۆکە پاش
بەرزبوونەوەی لە زەوی): *( ~ wings)* .
(٢) هێنەرەوەیەک؛ توانای هێنانەوەیەکی شتێکی تری هەیە (هێز، شت).

**contraction** (kən-trak′shən), *n.* (١) چوونەوەیەک (کانزا).
(٢) کرژبوون (ماسولکە)؛ هاتنەوەیەک یا ڕەق بوون (ماسولکە).
(٣) (ا) کورتکردنەوەی وشە یا دەستەواژە بە لابردنی تیپێک یا زیاتر (ڕێزمان).
(ب) وشەیەکی کورتکراوە بەم جۆرە.
**-contractive** *(adj.).*

**contractor** (kon′trak-tēr), *n.* (١) قۆنتەراتچی (خانوو، ڕێگەوبان،
... هتد)؛ بەڵێندەر *( a building ~ )* .
(٢) لایەنێک لەو لایەنانەی پەیمانێک یا ڕێکەوتنێک مۆر دەکات.
(٣) شتێک کە دێتەوەیەک یا کورت دەبێتەوە یا کرژ دەبێت (ماسولکە).

**contractual** (kən-trak′chōō-əl), *adj.* تایبەتی بە ڕێکەوتن،
پەیمان، یا قۆنتەرات.

**contradict** (kon′trə-dikt′), *v.t.* (١) بەدرۆخستنەوە.
(٢) بەرپەرچدانەوە (وتە، دووان).
(٣) لەگەڵ نەگونجان؛ یەک نەکەوتن؛ دژبوون.
*v.i.* بەرپەرچدانەوە

**contradiction** (kon′trə-dik′shən), *n.* (١) بەدرۆخستنەوە.
(٢) بەرپەرچدانەوە. (٣) لەگەڵ یەک نەگونجاو؛ ناکۆک؛ پێچەوانە؛ دژ.
(٤) وتەیەک کە بەرپەرچی خۆی دەداتەوە.
(٥) کەسێک یا شتێک کە لەگەڵ خۆیدا نەگونجێت.

**contradictory** (kon′trə-dik′tēr-i), *adj.* (١) ناکۆک؛ دژ بە یەکتر؛
لەگەڵ یەک نەگونجاو: *( ~ statements)* .
(٢) بەرپەرچدەرەوە؛ بەدرۆخەرەوە.
*n.pl.* هەریەک لە دوو بیری ناکۆک (بیردۆز).

**contradistinction** (kon′trə-dis-tiŋk′shən), *n.* جیاوازی
لەڕێی بەراوردکردنەوە؛ جیاکردنەوەی دوو شت بە بەراوردکردنیان لەگەڵ یەکتر.
**-contradistinctive** *(adj.)*; **contradistinctively** *(adv.).*

**contradistinguish** (kon′trə-dis-tiŋ′gwish), *v.t.* لەیەکتر-
جیاکردنەوەی دووشت بە بەراوردکردنیان لەگەڵ یەکتر.

**contraindicate** (kon′trə-in′də-kāt′), *v.t.* بە باش نەزانین یا
پەسەندنەکردنی چارەسەرێک کە نیازبووە بکرێت (پزیشکەوانی).
**-contraindication** *(n.).*

**contralto** (kən-tral′tō), *n.* (١) نزمترین دەنگی گۆرانی وتنی ژنێک لە
ئۆپەرایەکدا. (٢) ژنێک کە ئەم جۆرە دەنگەی هەبێت.
(٣) ڕۆڵێک کە پێویستی بەم جۆرە دەنگە هەبێت.

**contraposition** (kon′trə-pə-zish′ən), *n.* هەڵوێستی دژ بە؛
ناکۆکی؛ دژ.

**contraption** (kən-trap′shən), *n.* [Colloq.], کەلەکەتڕێ؛
ئامێرێک کە سەیر درووست کرابێت یا پێکەوەنرابێت (ئەم وشەیە بۆ گاڵتە-
پێکردن یا بە سووک سەیرکردنی شتێک بەکاردەهێنرێت).

**contrapuntal** (kon′trə-pun′t'l), *adj.* تایبەتی بە پێکەوە لێدانی
دوو ئاوازی مۆسیقا کە تا چەند لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن، هەروەها سەربەخۆن

**contrapuntist** (kon′trə-pun′tist), *n.* کەسێکی شارەزا لەم جۆرە
هونەرەدا (وشەی پێشوو ببینە).

**contrariety** (kon′trə-rī′ə-ti), *n.* (١) ناکۆک (بیر، وتە، کردەوە)؛
نەگونجان؛ دژ بە یەک.
(٢) شتێکی ناکۆک یا نەگونجاو لەگەڵ شتێکی تردا.

**contrariness** (kən-trâr′i-nis, kon′trer-i-nis), *n.* نەگونجان؛
ناکۆکی (وتە، بیر، کردەوە).

**contrarious** (kən-trâr′i-əs), *adj.* [Rare or Obs.], دژ؛ ناحەز؛
نالەبار.

**contrariwise** (kon′trer′i-wīz′), *adv.* (١) بەپێچەوانەوە (بیر،
هەڵوێست)؛ بەپێچەوانەی ئەوە؛ بە دژی ئەوە. (٢) بە هەڵەوگێڕاوەیی.
(٣) نالەبارانە؛ بە نالەباری

**contrary** (kon′trer-i), *adj.* (١) پێچەوانە؛ بەپێچەوانەوە؛ دژ:
*( ~ to the doctor's advice)*
(٢) نەهات؛ ناپەسەند: *( The ship was delayed by ~ winds.)*
(٣) کەللەڕەق؛ ناژاوەچی؛ ناپەسەند.
*n.* شتێکی پێچەوانە؛ شتێک کە دژ بە شتێکی ترە.
*adv.* بەپێچەوانەوە.
by contraries, بەپێچەوانەی ئەوەوە کە چاوەڕوان دەکرێت:
*( Many things in our lives go by contraries.)*
on the contrary, بەپێچەوانەی ئەوەوە؛ بەپێچەوانەوە:
*( You think I have nothing to do. On the contrary, I am very busy.)*
to the contrary, بەپێچەوانەی ئەوەوە:
*( I will come on Monday unless you write me to the- contrary.)*

**contrast** (kən-trast′), *v.t.* بەراووردکردن؛ جیاوازی پیشاندان؛
بەرامبەرکردن: *( C~ Tom with his brother!)* .
*v.i.* لەگەڵ یەکتردا جیاوازبوون: *( Her actions ~ with her words.)* .
*n.* (١) بەراووردکردن؛ بەراووردی؛ بەراوورد.
(٢) جیاوازییەکی ئێجگار زۆر؛ جیاوازی:
*( The ~ between the two brothers is remarkable.)*
(٣) کەسێک یا شتێکی زۆر جیاواز (لەئەنجامی بەراووردکردندا).
(٤) ئەنجامی کارتێکردنی دوو شتی جیاواز بەتەنیشت یەکەوە (وێنە، دیمەن).

**contrasty** (kən-tras′ti), *adj.* زۆر جیاوازبوون لە ڕوونی و لێڵیدا
(وێنەگری).

**contravene** (kon′trə-vēn′), *v.t.* (١) شکاندن (یاسا، نەریت)؛
پێشێل کردن: *( to ~ a law or a custom)*
(٢) لەگەڵدا نەگونجان؛ لەگەڵدا ڕێک نەکەوتن؛ دژ وەستان.

(٣) بەربەرەکانی کردن؛ بەرپەرچدانەوە (دووان): ***(to ~ a statement)*** .

**contravention** (kon´trə-ven′shən), ***n.*** (١) شکاندن (یاسا، نەریت). (٢) لەگەڵ نەگونجان؛ بەرپەرچدانەوە؛ بەربەرەکانی کردن (دووان)؛ دژ.

**contredanse** (kōn´trə-däns′), ***n.*** (١) سەمای بەرامبەری: جۆرە سەمایەکی فۆلکلۆرییە بریتییە لە ڕیزبوونی سەماکەرەکان بە جووت جووت لە دوو هێڵی بەرامبەردا. (٢) ئاوازی مۆسیقایی ئەم جۆرە سەمایە.

**contretemps** (kōn′trə-tän´), ***n.*** ڕووداوێکی دڵتەزێن؛ ڕووداوێکی بەدبەختی چاوەڕوان نەکراوی تەریق کەرەوە.

**contribute** (kən-trib′yoot), ***v.t. & v.i.*** (١) باربووکردن (پارە، خواردەمەنی، شتومەك)؛ پێدان (لەکاتی لێقەوماندا)؛ پیتاك کردن؛ یارمەتیدان:
***(He ~d money, food, and clothing to the victims of the war.)***
(٢) بەشداری کردن؛ بەشداربوون؛ هاوبەشی کردن (ئەرك، کردار، بیروباوەڕ):
***(to ~ ideas or suggestions; to ~ to the work of an academy)***
(٣) نووسین و بلاوکردنەوەی ووتار یا هۆنراوە لە گۆڤار یا ڕۆژنامەدا بەخۆڕایی یا بە پارە؛ هاوکاری کردن:
***(He ~s to several newspapers and journals.)***

**contribute to,** دەست تێدابوون (هێنانەدی ئامانجێك)؛ بوون بە هۆ:
***(Drink contributed to his ruin.)***

**-contributable *(adj.)*; contributive *(adj.)*.**

**contribution** (kon´trə-bū′shən), ***n.*** (١) باربووکردن؛ دەستی یارمەتی درێژکردن لەکاتی لێقەوماندا.
(٢) باربوو: ئەوەی باربوو کراوە (پارە، خواردەمەنی، شتومەك)؛ پیتاك؛ یارمەتی.
(٣) باجی جەنگ: باجێکی تایبەتییە کە لە خەڵك دەسەنرێت لەکاتی جەنگدا.
(٤) نووسراوێك کە دەدرێت یا دەفرۆشرێت بە ڕۆژنامە یا گۆڤارێك بۆ بلاوکردنەوە.

**contributor** (kən-trib′yoo-tēr), ***n.*** (١) باربووکەر؛ یارمەتیدەر.
(٢) نووسەرێك کە ووتار یا هۆنراوە بۆ گۆڤار یا ڕۆژنامەیەك دەنووسێت؛ هاوکاری گۆڤار یا ڕۆژنامەیەك: ***(The magazine has many ~s.)*** .

**-contributory *(adj.)*.**

**contrite** (kən-trīt′, kon′trīt), ***adj.*** (١) پەشیمان (لە کردنی گوناه)؛ هەستکەر بە کردنی گوناهێکی گەورە و پاشگەزبووەوە لەو گوناهە.
(٢) نیشانەی پەشیمانی لە گوناه: ***(~ words)*** .

**contrition** (kən-trish′ən), ***n.*** پەشیمانی لە کردنی گوناهێکی گەورە؛ پەشیمان بوونەوە؛ هەستکردن بە گوناه کردن و پەشیمان بوونەوە لەو گوناهە

**contrivance** (kən-trīv′əns), ***n.*** (١) دروستکردن (ئامێر، پیلان)؛ هەڵبەستن (درۆ). (٢) شتێکی دروستکراو یا هەڵبەستراو: (ا) پێکار، ئامێر. (ب) پیلان، درۆ، فێڵ.

**contrive** (kən-trīv′), ***v.t.*** (١) دۆزینەوە (پلان، ڕێباز، چارەسەر).
***(We must ~ a way to deal with the problem.)***
(٢) دروستکردن (ئامێر، پێکاں)؛ داتاشین:
***(They have ~d an automatic dishwasher.)***
(٣) پیلان گێڕان؛ هەڵبەستن (درۆ).
(٤) سەرکەوتن لە کردنی شتێکدا بە زانایی و زیرەکی خۆ:
***(He ~d to get in.)***
***v.i.*** پیلان گێران؛ هەڵبەستن؛ نەخشەکێشان

**-contriver *(n.)*.**

**control** (kən-trōl′), ***v.t.*** (١) تاقیکردنەوەی ڕاستی شتێك بە بەراوورد کردن لەگەڵ شتێکدا کە دەزانرێت ڕاستە (دارایی کۆمپانیایەك).
(٢) ڕێك و پێك کردنی کاروباری دارایی.
(٣) چاودێری کردن؛ فەرمان بەسەردا کردن؛ دەست بەسەردا گرتن.
(٤) جڵەوگرتن؛ سنوور بۆ دانان؛ ڕاگرتن:
***(C~ yourself!; A good rider knows how to ~ his horse.)***
***n.*** (١) دەسەلات؛ دەسەلات بەسەردابوون.
(٢) جڵەوگیری؛ دابینکردن؛ چاودێری؛ ڕکێف.
(٣) هۆی دابینکردن یا جڵەوگرتن. (٤) ئەندازە؛ پێوانە.
(٥) (*pl.*)، ئامێری لێخوڕین (فڕۆکە، پاپۆڕ، شەمەندەفەر، ئوتومبیل).

**lose control,** لەژێر ڕکێفدا نەمان؛ دەست بەسەردا نەڕۆیشتن؛ بۆ دابین نەکران؛ لەژێر دەست دەرچوون.

**gain control,** هێنانە ژێر ڕکێفەوە؛ خستنە ژێر دەست؛ دابینکردن.

**beyond control,** لە دەست دەرچوو؛ لەژێر ڕکێفدا نەماو.

**out of control,** لە دەست دەرچووە؛ دابین نەکراو؛ ڕاگیر ناکرێت؛ لەژێر دەستدا نەماوە.

**under control,** دابین دەکرێت؛ لەژێر ڕکێفدا بوون؛ ڕێك و پێك:
***(The situation is under control.)***

**controllable** (kən-trōl′ə-b′l), ***adj.*** دابین دەکرێت؛ ڕاگیر دەکرێت؛ دەستی بەسەردا دەڕوات؛ ڕێك و پێك دەکرێت.

**controller** (kən-trōl′ēr), ***n.*** (١) ژمێریار؛ لێپرسراوی خەرجی دەزگایەکی میری. (٢) بەڕێوەبەر؛ فەرماندە؛ ڕاگیرکەر.
(٣) ئامێری ڕاگرتنی خێرایی و ووزەی مەکینەیەك.

**-controllership *(n.)*.**

**controversial** (kon´trə-vûr′shəl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە چەندو چوون و ڕێك نەکەوتن لەسەر مەسەلەیەك؛ مشت و مڕی (مەسەلە، مرۆڤ):
***(Abortion is a ~ subject.; He is a ~ person.)***
(٢) حەزکەر لە چەندوچوون؛ مشت و مڕکەر.

**controversy** (kon′trə-vûr´si), ***n.*** (١) ئاکۆکی؛ مشت و مڕ؛ ڕێك نەکەوتن لەسەر مەسەلەیەك؛ بگرە و بەردە. (٢) مەسەلەیەك کە ڕای خەڵك زۆر جیاواز بێت دەربارەی و مشت و مڕیان لەسەری بێت.

**controvert** (kon´trə-vûrt′), ***v.t.*** (١) بەدرۆخستنەوە؛ دژ وەستان؛ بەرپەرچدانەوە. (٢) مشت و مڕ لەسەر کردن؛ لێکۆڵینەوە.

**controvertible** (kon´trə-vûr′tə-b′l), ***adj.*** بەدرۆ دەخرێتەوە (ووتە، بیروباوەڕ، هەڵوێست)؛ دەتوانرێت بەرپەرچ بدرێتەوە.

**contumacious** (kon´too-mā′shəs, kon´tyoo-mā′shəs), ***adj.*** سەرکێش؛ یاخی؛ مل نەدەر؛ سەرپێچیکەر.

**contumacy** (kon′too-mə-si, kon′tyoo-mə-si), ***n.*** یاخی‌بوون؛ سەرپێچی؛ مل نەدان؛ سەرکێشی (بەتایبەتی بەرامبەر بە دادگایەك).

**contumelious** (kon´too-mē′li-əs, kon′tyoo-mē′li-əs), ***adj.*** لووت بەرز؛ بەفیز؛ بە سووك سەیری خەڵك کەر؛ بێ نەزاکەت.

**contumely** (kon′too-mə-li, kon′tyoo-mə-li, kən-tōō′-mə-li, kon′too-mē′li), ***n.*** (١) لووت بەرزی و قسەڕەقی؛ بێ نەزاکەتی؛ بە سووکی سەیری خەڵك کردن. (٢) بێ نەزاکەتی نواندن لەگەڵ کەسێکدا؛ بە سووکی سەیرکردنی کەسێك.

**contuse** (kən-tōōz′, kən-tūz′), ***v.t.*** ڕووشاندن (پێست)؛ خوێن‌تێزان (پێست)؛ شینکردنەوە (پێست)؛ ئازاردانی پێست بەبێ برینی.

**-contusion *(n.)*.**

**conundrum** (kə-nun′drəm), ***n.*** (١) مەتەڵ؛ مەتەڵێك کە وەڵامەکەی بریتی بێت لە یاری کردن بە ووشە و دەنگی. (٢) پرسیارێکی سەرلێ شێوێنەر؛ کێشەیەکی سەرسووڕمێنەر.

**convalesce** (kon´və-les′), ***v.i.*** چاکبوونەوە دوای نەخۆشی؛ بووژانەوە دوای نەخۆشی.

**convalescence** (kon´və-les′′ns), ***n.*** (١) چاکبوونەوەی دوای نەخۆشی؛ بووژانەوەی دوای نەخۆشی.
(٢) ماوەی ئەم چاکبوونەوە یا نەخۆشییە.

**convalescent** (kon´və-les′′nt), ***adj.*** (١) چاك دەبێتەوە و دێتەوە سەر خۆی پاش نەخۆشی؛ دەبووژێتەوە پاش نەخۆشی.
(٢) تایبەتی بە چاکبوونەوە و بەخۆداهاتنەوە پاش نەخۆشی.
***n.*** کەسێك کە لە چاکبوونەوە و بووژانەوەدایە پاش نەخۆش کەوتن.

**convalescent home (or hospital),** (١) بووژانگە.
(٢) شوێنێکە وەك نەخۆشخانە بۆ کەسانی نەخۆش و پیر و کەفتەکار؛ خانەی پیران.

**convection** (kən-vek′shən), *n.* (١) گەیاندن؛ گواستنەوە
(٢) گەیاندنی گەرمی یا کارەبا بە بەرزبوونەوەی گەردە گەرمەکانی ئاو یا هەوا (فیزیا).
-**convectional** *(adj.)*; **convective** *(adj.).*
**convector** (kən-vek′tẽr), *n.* گەیەنەری گەرما یا کارەبا؛ شوێنێکی داخراوو گەرم کە پلەی گەرمی بەرز دەبێتەوەو شوێنەکە هەمووی گەرم دەکات.
**convene** (kən-vēn′), *v.i.* کۆبوونەوە؛ کۆڕ بەستن.
*v.t.* (١) کۆکردنەوە؛ پەك پێکرتن؛ کۆڕ پێ بەستن.
(٢) بانگ کردن بۆ دادگا
**convener** (kən-vēn′ẽr), *n.* (١) کەسێکی ئامادەبوو (کۆبوونەوە).
(٢) بانگکەر بۆ کۆبوونەوە؛ کەسێك کە دەستەیەك بانگ دەکات بۆ کۆڕگرتن.
**convenience** (kən-vēn′yəns), *n.* (١) لوواز؛ شیان؛ گونجان.
(٢) ئاسوودەیی؛ ئاسوودەیی خۆ.
(٣) شتێك کە کاروباری ژیان ئاسان بکات؛ هۆی ئاسوودەیی:
*( A car is a ~ .; The house is full of ~ of every sort.)*
(٤) [British]؛ ئاودەستخانە.
**at one's convenience,** چۆن دەلوێت وەها؛ بە ئارەزووی خۆ؛ بە هەوەسی خۆ
**conveniency** (kən-vēn′yən-si), *n.* = **convenience.**
**convenient** (kən-vēn′yənt), *adj.* (١) شیاو؛ گونجاو؛ لەبار:
*( Is this a ~ time for you?; I will come and see you tomorrow if it is ~ for you.)*
(٢) نزیك؛ بەئاسانی دەیگەیەنێت.
**convenient to,** [Colloq.], بەئاسانی دەیگەبەنێت؛ بەئاسانی دەست دەکەوێت؛ نزیك
**convent** (kon′vənt, kon′vent), *n.* (١) پەرستگا؛ خەلوەتگا.
(٢) دەستەیەك ژنی خۆ تەرخان کردوو بۆ ئاین کە لە پەرستگا یا خەلوەتگادا دەژین (خاچ پەرستی)
**conventicle** (kən-ven′ti-k'l), *n.* (١) کۆبوونەوەیەکی ئاینی نهێنی یا قەدەغە ٢) شوێنی ئەم جۆرە کۆبوونەوەیە
(٣) کۆبوونەوەیەکی ئاینی قەدەغە لە ئینگلتەرە لەلایەن ئەو پرۆتستانتانەی سەر بە کلێسەی ئینگلتەرە نەبوون لە سەدەی شانزەو حەڤدەدا.
**convention** (kən-ven′shən), *n.* (١) کۆنگرە (رامیاری، ئابووری، ئاینی، زانستی، پیشەیی... هتد). (٢) ئەندامان یا نوێنەرانی کۆنگرەیەك.
(٣) پەیمان؛ رێکەوتن (بەتایبەتی لەنێوان وولاتاندا).
(٤) نەریت؛ دەستوور (دەربارەی رەووشتی کۆمەلایەتی)؛ پیشە (رەفتار)؛ رێکەوتنی گشتی ناو کۆمەڵ دەربارەی رەفتاری کۆمەلایەتی یا بەکارهێنانی زمان بە جۆرێکی تایبەتی: *( C~ requires us to use the right hand when we shake hands.)*
**conventional** (kən-ven′shən-'l), *adj.* (١) بەگوێرەی نەریت و دەستووری کۆمەڵ (رەووشت)؛ شیاو لەگەڵ نەریتی کۆمەڵ: *( ~ behavior)* .
(٢) پەرپووت (ووتە)؛ سادە: *( The chairman made a ~ speech.)* .
(٣) کۆن؛ کۆنباو؛ لەسەر دەستووری کۆن: *( ~ art; a ~ design)* .
(٤) تایبەتی بە پەیمان یا رێکەوتنی دوولایی.
(٥) (ا) نا ئەتۆمی *( ~ weapons)*
(ب) هێزی نا ئەتۆمی بەکاردەهێنێت: *( ~ war)*
-**conventionally** *(adv.)*; **conventionalize** *(v.t.)*; **conventionalization** *(n.).*
**conventionalism** (kən-ven′shən-'l-iz'm), *n.* (١) کۆنباوی؛ لەسەر دەستووری کۆن رۆیشتن (رەووشت، بەکارهێنانی زمان، ووتە... هتد).
(٢) شتێکی کۆنباو یا لەسەر دەستووری کۆن رۆیشتوو.
**conventionalist** (kən-ven′shən-'l-ist), *n.* کەسێك کە لەسەر دەستوورو نەریتی کۆن بڕوات؛ کەسێکی کۆنباو.
**conventionality** (kən-ven′shən-al′ə-ti), *n.* (١) کۆنباوی؛ لەسەر رێ‌وشوێنی کۆن رۆیشتن. (٢) رەووشت یا کردەوەیەکی کۆنباو.

(٣) پەیڕەوو دەستووری رەووشتی کۆمەلایەتی کۆنباو.
**conventioneer** (kən-ven′shən-êr′), *n.* ئەندامی کۆنگرەیەك؛ کەسێك کە ئامادەبێت لە کۆنگرەیەکدا.
**conventual** (kən-ven′choo-əl), *adj.* تایبەتی بە پەرستگا یا خەلوەتگایەك (خاچ پەرستی).
*n.* ئەندامێکی پەرستگا یا خەلوەتگایەك.
**converge** (kən-vũrj′), *v.i.* (١) یەککرتن لە یەك خاڵدا (دوو هێل یا زیاتر)؛ بەیەکگەیشتن لە یەك شوێندا. (٢) لە هەموو لایەکەوە بەرەو یەك شوێن رۆیشتن و یەککرتنەوە لەو شوێنەدا (خەڵك، سوپا، کاروان، گەشتیار، گیاندار، باڵندە... هتد). (٣) بەرەو یەك ئامانج چوون؛ نزیکبوونەوە لەیەکتری و یەککرتن لە ئەنجامدا (رێباز، بیروباوەڕ)؛ چوون بەرەو.
*v.t.* بە یەك گەیاندن (لە خاڵ یا شوێنێکدا)؛ یەك پێکرتنەوە
**convergence** (kən-vũr′jəns), *n.* (١) یەککرتنەوە لە یەك خاڵ یا شوێندا؛ نزیکبوونەوە لە یەك شوێندا. (٢) (ا) پلەی لە یەك نزیکبوونەوە.
(ب) شوێنی بەیەکگەیشتن یا لەیەکتر نزیکبوونەوە.
(٣) پێکهاتنی لەیەکچوون لە گیانەوەری جیاوازدا کە لە هەمان دەوروبەردا بژین
**convergency** (kən-vũr′jən-si), *n.* = **convergence.**
**convergent** (kən-vũr′jənt), *adj.* یەککرتوو؛ بەیەکگەیشتوو؛ نزیك.
**converging lens,** هاوێنەی کۆکەرەوە؛ گەردبینی کۆکەرەوە.
**conversable** (kən-vũr′sə-b'l), *adj.* (١) بەئاسانی قسەی لەگەڵ دەکرێت؛ ڕووخۆش. (٢) حەز لە گفتوگۆ دەکات؛ حەز لە دەمەتەقێ دەکات.
(٣) بۆ دەمەتەقێ دەشێت؛ بەکەڵکی گفتوگۆ یا لێدووان دێت.
**conversance** (kon′vẽr-s'ns, kən-vũr′s'ns), *n.* شارەزایی؛ زانین؛ زانایی.
**conversancy** (kon′vẽr-s'n-si, kən-vũr′s'n-si), *n.* = **conversance.**
**conversant** (kon′vẽr-s'nt, kən-vũr′s'nt), *adj.* **( ~ with ),** شارەزا (لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو کار تێدا کردندا)؛ بزان؛ سەردەرچوو؛ زانا؛ تێگەیشتوو: *( He's not yet ~ with the new rules.)* .
**conversation** (kon′vẽr-sā′shən), *n.* (١) دەمەتەقێ؛ گفتوگۆ؛ پێکەوە قسەکردن: *( I had a long ~ with her.)* .
(٢) جووت بوون؛ گان: تەنها لەم دەستەواژەیەدا **criminal conversation** واتە " داوێن پیسی " کە بەڵگەی تەڵاقدانە (دادگەری).
(٣) شارەزایی؛ زانین؛ سەر دەرچوون.
(٤) [Archaic]، شێوەی ژیان.
**conversational** (kon′vẽr-sā′shən-'l), *adj.* (١) دەمەتەقێیی؛ تایبەتی بە گفتوگۆ یا قسەکردن: *( ~ language)* .
(٢) حەز لە دەمەتەقێ دەکات؛ دەم‌ودووخۆش؛ قسەخۆش؛ بەگفتوگۆ.
**conversationalist** (kon′vẽr-sā′shən-'l-ist), *n.* بەدەم‌ودوو؛ حەزکەر لە قسەکردن؛ کەسێك کە حەز لە دەمەتەقێ بکات و لێهاتوو بێت تێیدا.
**conversationally** (kon′vẽr-sā′shən-'l-i), *adv.* (١) بەشێوەی گفتوگۆ؛ بەشێوەی دەمەتەقێ. (٢) لە گفتوگۆدا؛ لە دەمەتەقێدا؛ لە قسەکردندا.
**conversation piece,** (١) شتێکی نائاسایی کە هەمووکەس لێی دەدوێت؛ شتێکی نایاب یا ڕووداوێکی نائاسایی کە هەمووکەس قسەی لەسەر بکات. (٢) وێنە یا تابلۆیەکە کە بەگزادە پیشان دەدات لە دەوروبەری خۆیاندا (لە سەدەی هەژدەهەمدا باوبوو).
**conversazione** (kon′vẽr-sät′si-ō′ni), *n.* کۆڕێکی وێژەیی یا هونەری؛ کۆبوونەوەیەك بۆ دووان لە هونەرو وێژە.
**converse** (kən-vũrs′), *v.i.* ئاخاوتن؛ دووان؛ گفتوگۆکردن؛ قسەکردن؛ دەمەتەقێ‌کردن.
*n.* دووان؛ گفتوگۆ؛ قسە؛ دەمەتەقێ؛ ئاخاوتن.
**converse** (kən-vũrs′), *adj.* پێچەوانە؛ دژ؛ هەڵگەڕاوە.
*n.* (١) شتێکی پێچەوانە؛ دژ: *( "Hot" is the ~ of "Cold" .)* .
(٢) شتێکی پاش‌وپێش خراو یا هەڵگەڕاوە.
**conversely** (kən-vũrs′li, kon′vẽrs′li), *adv.* بەپێچەوانەی-

ئەوەوە؛ بەڵام بەپێچەوانەوە؛ بەڵام لەسەرێکی ترەوە:
***( Some are well but unhappy; ~ , others are happy but ill.)***

**conversion** (kən-vūr′zhən, kən-vūr′shən), *n.* (١) گۆڕین؛ هەڵگەڕانەوە؛ گۆڕان. (٢) (ا) گۆڕین یا گۆڕانی کەسێك لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر؛ هێنانەسەر ئاینێکی تر؛ هاتنەسەر ئاینێکی تر؛ ئاین گۆڕین.
(ب) گۆڕین یا گۆڕانی بیروباوەڕی کەسێك؛ هەڵگەڕانەوەی کەسێك لە ڕێبازێکەوە بۆ ڕێبازێکی تر (٣) گۆڕینەوەی پارە. (٤) گۆڕین (پێوانە، کێش).
(٥) (ا) دەست بەسەرداگرتن یا زەوت کردنی زەوی یا پارەی کەسێکی تر.
(ب) گۆڕینەوەی زەوی‌وزار بە پارە یا بەپێچەوانەوە.
(٦) گۆڕینی ژمارە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر بەبێ گۆڕینی نرخەکەی (بیرکاری)

**convert** (kən-vūrt′), *v.t.* (١) گۆڕین (شێوە):
***( to ~ water into steam; grain into flower; a bedroom into a livingroom; and dollars into pounds.)***
(٢) وەرگێران؛ گۆڕین (ئاین، بیروباوەڕ، هەڵوێست)؛ هەڵگەڕانەوە (ئاین، ڕێبان).
(٣) پارە گۆڕینەوە لە دراوێکەوە بۆ دراوێکی تر.
(٤) (ا) دەست بەسەرداگرتن یا زەوت کردنی زەوی‌وزاری کەسێکی تر.
(ب) گۆڕینەوەی زەوی‌وزار بە پارە یا بەپێچەوانەوە.
(٥) (ا) گۆڕینی تەووژمی کارەبا (لە ڕاستەوخۆ بۆ ناڕاستەوخۆ).
(ب) گۆڕینی لەرە (رادیۆ، تەلەفزیۆن).
*v.i.* (١) گۆڕان (لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر)؛ گۆڕان (لە ڕێباز یا بیروباوەڕێکەوە بۆ ڕێباز یا بیروباوەڕێکی تازە). (٢) گۆڕان (شێوە).
*n.* کەسێك کە ئاینەکەی بگۆڕێت بە ئاینێکی تر یا ببێ بە ئایندار.

**converter** (kən-vūr′tēr), *n.* (١) گۆڕەر (ئاین، ڕێبان)؛ کەسێك کە دەگۆڕرێت. (٢) ئامێری گۆڕینی کەرەسەی خاو بۆ شتی درووستکراو.
(٣) کوورەی گۆڕینی ئاسن بۆ پۆڵا.
(٤) (ا) ئامێری گۆڕینی تەووژمی کارەبا (لە ڕاستەوخۆوە بۆ ناڕاستەوخۆ).
(ب) ئامێری گۆڕینی لەرە (رادیۆ، تەلەفزیۆن).
(ج) ئامێری گۆڕینی زانیاری لە شفرەیەکەوە بۆ شفرەیەکی تر.

**convertible** (kən-vūr′tə-b'l), *adj.* (١) دەگۆڕرێت؛ توانای گۆڕانی هەیە؛ دەتوانرێت بگۆڕرێت. (٢) سەرەکەی دەکرێتەوەو قەد دەکرێت (ئوتومبیل).
(٣) دەگۆڕرێتەوە (پارە، دراو): ***( Dollars ~ into pounds)*** .
*n.* (١) ئوتومبیلی تەنتە؛ ئوتومبیلێك کە سەرەکەی هەڵدەدرێتەوەو قەد دەکرێت.
(٢) شتێك کە سەرەکەی بکرێتەوەو قەد بکرێت.
**-convertibility** ***(n.)***; **convertibleness** ***(n.)***.

**convertite** (kon′vēr-tīt′), *n.* [Archaic], (١) کەسێك کە چووبێتە سەر ئاینێکی تر. (٢) ئافرەتێکی سووك کە لە خراپە لای دابێت‌و تۆبەی کردبێت.

**convex** (kon-veks′, kən-veks′, kon′veks), *adj.* قۆقز (ڕوو، شت).
*n.* شتێکی قۆقز؛ ڕوویەکی قۆقز.

**convexity** (kən-vek′sə-ti), *n.* (١) قۆقزی؛ قۆقزێتی.
(٢) شتێکی قۆقز؛ ڕوویەکی قۆقز.

**convexo-concave** (kən-vek′sō-kon-kāv′), *adj.* (١) دیوێکی قۆقزەو دیوێکی قوپاو. (٢) تایبەتی بە هاوێنەیەك کە دیوێکی قۆقزەو دیوێکی قوپاوە، بەڵام قۆقزییەکەی زیاترە بە جۆرێك کە ناوەڕاستی هاوێنەکە لە هەموو لە هەموو شوێنێکی تری ئەستوورتر بێت.

**convexo-convex** (kən-vek′sō-kon-veks′), *adj.* تایبەتی بە شتێك یا ڕوویەك کە هەردوو دیوی قۆقز بێت.

**convey** (kən-vā′), *v.t.* (١) گواستنەوە؛ هەڵگرتن‌و گوێزانەوە:
***( Some trains ~ both passengers and goods.)***
(٢) گەیاندن (کارەبا)
(٣) ڕاگەیاندن؛ پێ گەیاندن (دەنگوباس، سڵاو)؛ دەربڕین:
***( Her looks ~ a lot.; I will ~ the information to him.; Please ~ my sympathies to them.)***
(٤) تاپۆی زەوی‌وزار یا خانوو خستنەسەر کەسێکی تر.
(٥) [Obs.]، دزین.

**conveyance** (kən-vā′əns), *n.* (١) گواستنەوە؛ ڕاگەیاندن؛ دەربڕین.
(٢) هۆی گواستنەوە (ئوتومبیل).
(٣) تاپۆی زەوی‌وزار یا خانوو خستنەسەر کەسێکی تر.
(٤) قەواڵە یا بەڵگەنامەی ئەم خاوەن گۆڕینە؛ تاپۆ.

**conveyancer** (kən-vā′ən-sēr), *n.* پارێزەری تاپۆی زەوی‌وزارو خانوو خستنەسەر کەسێکی تر؛ ئامادەکەری تاپۆ.

**conveyer, conveyor** (kən-vā′ēr), *n.* (١) گەیەنەر (مرۆڤ، ئامێر). (٢) ئامێرێکی جووڵاو وەك قایشێکی پان کە شت دەگوێزێتەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لە کارگە یا چێشتخانەیەکی گەورەدا.

**convict** (kən-vikt′), *v.t.* سەلماندنی تاوانی گومانبارێك (دادگا)؛ تاوانبارکردن: ***( The jury ~ed him of theft.)*** .
*n.* (١) تاوانبار؛ تاوانبارێك کە دادگا سزای بەسەردا دابێت.
(٢) تاوانبارێك لە بەندیخانەدا؛ تاوانبارێك کە دادگا سزای بەسەردا دابێت‌و ماوەی سزاکەی لە بەندیخانەدا بەرێتەسەر.

**conviction** (kən-vik′shən), *n.* (١) تاوانباربوون لە دادگادا؛ تاوانبارکردن: ***( The ~ of the accused man was almost certain.)*** .
(٢) قایل کردن؛ دڵنیاکردن؛ بۆ ساغ کردنەوە.
(٣) دڵنیابوون؛ قایل بوون.
(٤) بیروباوەڕی چەسپاو؛ بیروباوەڕی توندو بەهێزو پتەو: ***( a man of ~ )*** .
**open to conviction,** ئامادەبوون بۆ گوێگرتن لە بەڵگەیەك کە کەسێك قایل بکات یا شتەکەی پێ بسەلمێنێت.

**convictive** (kən-vik′tiv), *adj.* (١) تاوانبارکەر (بەڵگە).
(٢) پێ سەلمێنەر؛ قایلکەر؛ دڵنیاکەر.

**convince** (kən-vins′), *v.t.* (١) پێ سەلماندن؛ قایل کردن؛ دڵنیاکردن؛ سازکردن. (٢) [Obs.]، تاوانبارکردن. (٣) [Obs.]، بەزاندن.

**convincible** (kən-vin′sə-b'l), *adj.* پێی دەسەلمێنرێت؛ قایل دەکرێت؛ دڵنیا دەکرێت.

**convincing** (kən-vin′siŋ), *adj.* (١) سەلمێنەر؛ قایلکەر؛ دڵنیاکەر: ***( a ~ argument)*** .
(٢) بڕوای پێ دەکرێت: ***( a ~ story)*** .

**convivial** (kən-viv′i-əl), *adj.* (١) ڕووخۆش‌و حەزکەر لە ئاهەنگ‌و خواردن‌و خواردنەوە لەگەڵ برادەراندا. (٢) تایبەتی بە ئاهەنگ‌و زەماوەند.
**-convivialist** ***(n.)***; **conviviality** ***(n.)***.

**convocation** (kon′və-kā′shən), *n.* (١) کۆڕگرتن (بەتایبەتی بۆ کاروباری زانستی لە زانکۆیەك یا ئاینی لە پەرستگایەکدا)؛ بانگ کردن بۆ کۆبوونەوە. (٢) کۆڕ؛ کۆبوونەوەیەکی گەورەی درێژخایەن لە زانکۆ یا دانشگایەکدا بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەیەکی گرنگ؛ کۆبوونەوەیەکی گەورەی قەشەو کۆڵەکەکانی کڵێسە.
**-convocational** ***(adj.)***.

**convoke** (kən-vōk′), *v.t.* بانگ کردن بۆ کۆبوونەوە؛ کۆکردنەوە؛ کۆڕگرتن.

**convolute** (kon′və-lōōt′, kon′və-lūt′), *adj.* لوول خواردوو؛ لوول؛ پێچ پێچ.
*v.t. & v.i.* پێچ پێدان؛ پێچ خواردن؛ لوولدان؛ لوول خواردن.

**convoluted** (kon′və-lōōt′id, kon′və-lūt′id), *adj.* (١) پێچ-پێچ؛ پێچ خواردوو؛ لوول؛ لوول خواردوو.
(٢) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ (نووسراو، ووتە، بیروباوەڕ).

**convolution** (kon′və-lōō′shən, kon′və-lū′shən), *n.* - (١) لوول خواردن؛ پێچ خواردن؛ تێك ئاڵان؛ تێك ئاڵاوی.
(٢) پێچ پێدان؛ لوول پێدان؛ تێك ئاڵاندن؛ ئاڵۆسکاندن.
(٣) پێچێك یا لوولێکی شتێکی پێچ خواردوو.
(٤) یەکێك لە پێچە قۆقزەکانی مێشك.

**convolve** (kən-volv′), *v.t.* تێك ئاڵاندن؛ لوولدان؛ پێچ پێدان.
*v.i.* تێك ئاڵان؛ ئاڵۆسکان؛ پێچ خواردن؛ لوول خواردن.

**convolvulus** (kən-vol′vyoo-ləs), *n.* لاولاو
**convoy** (kon′voi), *v.t.* لەگەڵ کاروان یا قافلەیەکدا ڕۆیشتن بەمەبەستی پاراستنی
*n.* (١) لەگەڵ کاروان یا قافڵەدا ڕۆیشتن بەمەبەستی پاراستنی.
(٢) ئەو هێزە سوپایی یا دەریایی‌یەی لەگەڵ کاروانێکدا دەڕوات بۆ پاراستنی.
(٣) کاروان یا قافڵەیەکی پارێزراو؛ کاروان.
**convulse** (kən-vuls′), *v.t.* (١) ڕاوەشاندن؛ بەتوندی ڕاوەشاندن؛ شڵەقاندن (٢) کرژکردن (ماسولکە)؛ تورت کردن.
(٣) هێنانە لەرزین لە پێکەنین، تووڕەیی، یا خەفەتدا.
**convulsion** (kən-vul′shən), *n.* (١) (*pl.*)، کرژبوون (ماسولکە)؛ ماسولکەڕەقە؛ تورت بوون. (٢) قاقای پێکەنینی بۆ نەوەستێنراو؛ پێکەنینێک کە وەک حاڵ لێهاتن وابێت، لەبەرئەوەی ناوەستێتەوە.
(٣) پشێوی‌یەکی توندو لەپڕ لە سرووشت یا کۆمەڵدا (بوومەلەرزە، شەڕی ناوخۆ): *( a ~ of nature; civil ~)* .
**convulsionary** (kən-vul′shən-er′i), *adj.* تایبەتی بە کرژبوون (ماسولکە؛ تایبەتی بە پشێوی سرووشت یا کۆمەڵ.
*n.* کەسێک کە حاڵی لێ دێت یا تووشی ماسولکەڕەقە دەبێت لەئەنجامی حاڵ لێهاتنی ئایینیدا (دەروێش)
**convulsive** (kən-vul′siv), *adj.* (١) وەک ماسولکەڕەقە وایە؛ ماسولکەڕەقەیی. (٢) ماسولکەڕەقەی لەگەڵە؛ تووشی ماسولکەڕەقە دەبێت.
(٣) دەبێت بەهۆی ماسولکەڕەقە؛ دەبێت بەهۆی پشێوی سرووشت یا کۆمەڵ:
*( ~ events)*
**cony** (kō′ni), *n. Also* **coney,** (١) کەروێشک.
(٢) فەروە یا کەوڵی کەروێشک.
(٣) [Archaic]، کەسێکی ساوێلکە؛ کەسێکی خۆشباوەڕ.
**coo** (kōō), *v.i.* (١) خوێندن (کۆتر، کۆترەباریکە).
(٢) بە نەرمی و خۆشەویستی‌یەوە لەگەڵ دڵداردا دوان.
*v.t.* بە نەرمی و خۆشەویستی‌یەوە دوان (دڵداری): *( to ~ one's words)* .
*n.* (١) خوێندن یا دەنگی خوێندنی کۆتر یا کۆترەباریکە.
(٢) دەنگێکی نەرمو خۆش (وەک دەنگی کۆتر).
**cook** (kook), *n.* چێشتکەر؛ چێشت لێنەر.
*v.t.* (١) چێشت لێنان؛ لێنان.
(٢) [Colloq.]، هەڵبەستن (درۆ، بوختان، قاو)؛ ڕێکخستن.
*v.i.* (١) چێشتکەری کردن؛ بوون بە چێشتکەر.
(٢) کوڵان *( These beans ~ well.)* .
(٣) [Slang]، ڕوودان: *( What's ~ing?)* .
**cook up,** [Colloq.], هەڵبەستن (درۆ، قاو، بوختان)؛ ڕێکخستن (پیلان):
*( He cooked up a story.)*
**cookbook** (kook′book′), *n.* پەرتووکی چێشت لێنان.
**cooker** (kook′ēr), *n.* (١) ئاگردان. (٢) مەنجەڵ.
**cookery** (kook′ēr-i), *n.* (١) هونەری چێشت لێنان؛ چێشت لێنان.
(٢) چێشتخانە؛ مووبەق.
**cookout** (kook′out′), *n.* خواردەمەنی‌یەک کە لەدەرەوەی ماڵ یا لە دەشت لێبنرێت و بخورێت (سەیران)؛ سەیران (بەتایبەتی کە خواردنەکە لەوێ لێبنرێت و بخورێت).
**cooky** (kook′i), *n.* بسکویت
**cool** (kōōl), *adj.* (١) فێنک؛ ساردی مام ناوەندی.
(٢) فێنککەرەوە: *( ~ clothes)* .
(٣) هێمن؛ لەسەرخۆ: *( He remained ~ in the emergency.)* .
(٤) (أ) سارد؛ نابەدڵ: *( a ~ reception)* .
(ب) بێ مەیل. *( She is ~ toward me.)* .
(٥) چاوقایم؛ بێ شەرم (مۆڕبوونەوە): *( a ~ stare)* .
(٦) ڕەنگی شین و سەوز یا خۆڵەمێشی: *( ~ colors)* .
(٧) [Colloq.]، بەبێ زیادە پێوەنان: *( He lost a ~ million.)* .
(٨) [Slang]، باش؛ زۆرباش: *( He is ~ .; She is ~ .)* .

*adv.* بە هێمنی؛ بە لەسەرخۆیی.
*n.* (١) شوێن، کات، یا شتێکی فێنک: *( the ~ of the evening)* .
(٢) فێنکی؛ ساردی مام ناوەندی.
(٣) [Slang]، هێمنی؛ لەسەرخۆیی: *( He regained his ~ .)* .
*v.i.* (١) فێنک بوونەوە؛ ساردبوونەوە. (٢) هێمن بوونەوە؛ هاتنەوە سەرخۆ.
*v.t.* (١) فێنک کردنەوە؛ ساردکردنەوە.
(٢) هێمن کردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ؛ هێواش کردنەوە.
**coolant** (kōōl′ənt), *n.* ساردکەرەوە؛ شلەیەکی ساردکەرەوە (مەکینە).
**cooler** (kōōl′ēr), *n.* (١) (أ) سەهۆڵدان.
(ب) ساردکەرەوە؛ سنووقێک کە سەهۆڵی تێ دەکرێت و خواردن و خواردنەوە و میوەو سەوزەی تێ دەکرێت بۆئەوەی بە ساردی بمێنێتەوە.
(٢) خواردنەوەی فێنککەرەوە.
(٣) [Slang]، بەندیخانە؛ ژووری بەندیخانە.
**cool-headed** (kōōl′hed′id), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ ژیر.
**coolie** (kōō′li), *n.* کرێکارێکی ناکارامە (بەتایبەتی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی دوور).
**coolish** (kōōl′ish), *adj.* مەیلەو فێنک؛ نەختێک فێنک.
**coolness** (kōōl′nis), *n.* (١) هێمنی؛ لەسەرخۆیی
(٢) ساردی (هەست).
**coon** (kōōn), *n.* (١) **racoon** .
(٢) [Slang]، قولەڕەش (ناتۆرەیەکی سووکە).
**coon's age,** [Colloq.], کاتێکی دووروودرێژ؛ کاتێکی زۆر.
**coop** (kōōp), *n.* (١) کولانە مریشک؛ کولانەی مریشک.
(٢) [Slang]، بەندیخانە؛ قەفەز؛ شوێنێ تیا بەستنەوە یا قەتیس کردن.
*v.t.* ( ~ up; ~ in ), بەندکردن؛ خستنە قەفەزەوە؛ بەستنەوە؛ قەتیس کردن.
**fly the coop,** [Slang], دەربازبوون؛ ڕاکردن.
**co-op** (kō-op′, kō′op′), *n.* [Colloq.], = **co-operative.**
**cooper** (kōōp′ēr, koop′ēr), *n.* بەرمیل دروستکەر یا چاککەرەوە
*v.t.* بەرمیل دروستکردن یا چاکردنەوە.
**cooperage** (kōōp′ēr-ij, koop′ēr-ij), *n.* (١) کارگە یا دووکانی بەرمیل دروستکردن و چاکردنەوە.
(٢) پیشەو کاری بەرمیل دروستکەرو چاککەرەوە یا بەرهەمەکەی.
(٣) کرێ یا نرخی دروستکردن و چاکردنەوەی بەرمیل.
**cooperate** (kō-op′ēr-āt′), *v.i.* (١) هەرەوەزکردن؛ هاوکاری کردن؛ کۆمەک کردن؛ یارمەتیدانی یەکتری. (٢) هەرەوەزی کردنی ئابووری.
(٣) یەکگرتن بۆ هێنانەدی ئامانجێک (شتومەک):
*( The weather, the scenery and other things ~d to make our holiday a success.)*
**cooperation** (kō-op′ēr-ā′shən), *n.* (١) هەرەوەزکردن؛ هاوکاری کردن؛ کۆمەک کردن؛ یارمەتیدانی یەکتری.
(٢) کۆمەڵەی هەرەوەزی؛ هەرەوەزی.
**cooperative** (kō-op′ēr-ā′tiv), *adj.* (١) هەرەوەزکەر؛ کۆمەککەر؛ هاوکاریکەر (مرۆڤ، هەڵوێست): *( ~ neighbours)* .
(٢) هەرەوەزی: *( a ~ store)* .
*n.* (١) فرۆشگا یا دووکانێکی هەرەوەزی؛ فرۆشگای هاوبەشی.
(٢) کۆمەڵەی هەرەوەزی؛ هەرەوەزی.
-**cooperatively** *(adv.)*; **cooperativeness** *(n.)*.
**cooperator** (kō-op′ēr-ā′tēr), *n.* (١) هاوکاریکەر؛ هەرەوەزکەر؛ کۆمەککەر. (٢) ئەندامێکی کۆمەڵەی هەرەوەزی.
**co-opt** (kō-opt′), *v.t.* هەڵبژاردنی ئەندامێکی تازە بۆ لیژنەیەک لەلایەن ئەندامانی لیژنەکەوە.
**coordinate** (kō-ôr′də-nit), *adj.* (١) هاوپلە؛ هاوتا (ڕێزمان).
*( ~ clauses)*
(٢) تایبەتی بە هاوتا یا هاوپلە.
*n.* (١) کەسێک یا شتێکی هاوپلە یا هاوتا. (٢) ئۆردنێت (بیرکاری).

*v.t.* (١) هاوتاکردن؛ هاوپلەکردن.
(٢) یەکخستن؛ ڕێکخستن:
*( to ~ one's movement in swimming; He ~d the work of the committee.)*
*v.i.* (١) هاوتابوون؛ هاوپلەبوون.
(٢) ڕێکەوتن؛ گونجان؛ ئامرازی پەیوەندی هاوتاکەر (ڕێزمان):
**( and, or, nor, for, so, but, yet)**
**coordination** (kō-ôr´də-nā′shən), ***n.*** (١) هاوتاکردن؛ هاوتایی؛ هاوپلەیی (٢) پێکەوە گونجان و کارکردنی ماسولکەکانی لەش بۆ کردنی کارێك (وەرزش)؛ یەککەوتن؛ گونجان.
(٣) یەکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن؛ بەڕێوەبردن؛ ڕێك‌وپێکی:
*( There was no ~ among the members of the committee.)*
**coordinator** (kō-ôr′də-nā´tēr), ***n.*** ڕێکخەر؛ بەڕێوەبەر:
*( the program ~ )*
**coot** (kōōt), ***n.*** (١) باڵندەیەکی ڕەشی ووشکانی قاچ تەنراوە ئەوەندەی مریشکێك دەبێت. (٢) مریشکە ڕەشە؛ جۆرە مراوی‌یەکە.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی ساویلکە یا بێ مێشك.
**cootie** (kōōt′i), ***n.*** [Slang], ئەسپێ؛ شتێکی بێ نرخ.
**cop** (kop), ***n.*** (١) لووتکە (گرد)؛ تەوقەسەر؛ پۆپنە.
(٢) پڕ تەشی‌یەك ڕێس.
**cop** (kop), ***n.*** [Slang], پۆلیس.
***v.t.*** [Slang], گرتن؛ دەست بەسەرداگرتن.
**copaiba** (kō-pā′bə, kō-pī′bə), ***n.*** حەوی‌یەکی بۆن خۆشە لە دروستکردنی دەرماندا بەکاردەهێنرێت
**copal** (kō′p'l, kō′pal), ***n.*** حەوی‌یەکی ڕەقە بۆ ڕووکەش کردن بەکار- دەهێنرێت.
**coparcenary** (kō-pär′s'n-er´i), ***n.*** (١) هاوبەشێتی میرات.
(٢) هاوبەشی؛ ئاوکۆیی؛ هاوبەشی خاوەنێتی.
***adj.*** تایبەتی بە هاوبەشی یا هاوبەشان.
**coparcener** (kō-pär′s'n-ēr), ***n.*** هاوبەشی میرات.
**copartner** (kō-pärt′nēr), ***n.*** هاوبەش؛ برابەش.
**copartnership** (kō-pärt′nēr-ship´), ***n.*** هاوبەشی؛ برابەشی.
**cope** (kōp), ***v.i.*** (١) ( **~ with** )، لە ووزە هاتن؛ توانا بەسەردا شکان:
*( She can ~ with her problems.; The police were unable to ~ with the crowds.)*
(٢) [Colloq.]، بەرەنگاربوونی کێشەکانی ژیان و هەوڵدان بۆ چارەسەر کردن یا زاڵبوون بەسەریاندا.
**cope** (kōp), ***n.*** (١) عەبای قەشە.
(٢) شتێکی داپۆشەر (چەتر، ئاسمان، گورمەن). (٣) **coping** .
***v.t.*** عەبا کردنەبەر؛ داپۆشین بە عەبا یا شتێکی وەها.
**copeck** (kō′pek), ***n.*** *Also* kopeck, کۆپێك پارەیەکی ووردەی یەکێتی سۆڤیەتی جارانە نرخەکەی سەدیەکی " ڕۆبل " ێکە.
**copesetic, copesettic** (kō´pə-set′ik), ***adj.*** [Slang], نایاب؛ زۆرباش.
**copestone** (kōp′stōn´), ***n.*** (١) بەردی تەوقەسەری دیوار، پایە، یا خانوو (کە بەشێکە لە گوێ سەبانەی لێژ بۆ ئاوڕێژی).
(٢) پۆپ؛ بەرزترین پلە؛ دوا دەست پیاهێنان (کار).
**copier** (kop′i-ēr), ***n.*** (١) لاساییکەرەوە؛ چاولێکەر؛ قۆپیەچی.
(٢) دەستنووسکەر؛ دەستنووسکار؛ نووسەرەوە.
**copilot** (kō′pī´lət), ***n.*** یاریدەدەری فڕۆکەوان.
**coping** (kōp′iŋ), ***n.*** گوێ سەبانەیەکی لێژ بەسەر خانوو، دیوار، یا پایەیەکدا بۆ ئاوڕێژی.
**copious** (kō′pi-əs), ***adj.*** (١) زۆروزەبەنە؛ فرە؛ بێ شومار:
*( a ~ supply of goods)*
(٢) زۆرنووس؛ بەرهەم زۆر؛ زۆربڵێ: ***( a ~ writer)*** .
**coplanar** (kō-plā′nēr), ***adj.*** هەمان ئاست؛ هەمان ڕوو (ئەندازە).



**copolymer** (kō-pol′i-mēr), ***n.*** ئاوێتەیەك (کیمیا) (ووشەی داهاتوو ببینە).
**copolymerization** (kō-pol´i-mēr-i-zā′shən), ***n.*** ئاوێتە- کردنێك کە بریتی‌یە لە ڕیزکردنی کەرەسەی جیاواز بەنۆرەو یەك لەدوای یەك بەشێوەی زنجیرەیەك (کیمیا).
**copper** (kop′ēr), ***n.*** (١) مس؛ مسی سوور.
(٢) مسین (شت)؛ شتێك کە لە مسی سوور دروست کرابێت. (٣) پلارەی مسین.
(٤) مسین (ڕەنگ)؛ وەك مسی سوور (ڕەنگ)؛ قاوەیی سوورباو.
***adj.*** قاوەیی‌یەکی سوورباو؛ مسین (ڕەنگ).
***v.t.*** ڕووکەش کردن بە مسی سوور؛ مسی سوور لێدان.
**copper** (kop′ēr), ***n.*** [Slang], پۆلیس.
**copperhead** (kop′ēr-hed´), ***n.*** (١) سەر مسین: مارێکی ژەهراوی ئەمەریکای باکوورە ڕەنگی سەری وەك مسی سوور وایە.
(٢) [C-]، هاووڵاتی‌یەکی بەشی ژووروی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە کە پشتیگری بەشی خوارووی دەکرد لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا (ناتۆرەیەکی سووکە).
**copperplate** (kop′ēr-plāt´), ***n.*** (١) تەبەقێك مسی سوورە وێنەو نەقشی لەسەر هەڵدەکەنرێت و وێنەی لەسەر دەردەهێنرێت یا چاپی پێ دەکرێت.
(٢) وێنەیەك کە بەم شێوەیە دەرهێنرابێت.
(٣) چاپکردن یا نەقش هەڵکەندن بەم شێوەیە.
**coppersmith** (kop′ēr-smith´), ***n.*** مسگەر.
**coppery** (kop′ēr-i), ***adj.*** (١) مسین (ڕەنگ)؛ مسی.
(٢) مسی تێدایە؛ تایبەتی بە مسی سوور.
**coppice** (kop′is), ***n.*** بێشەی دەوەن و بنچك؛ چڕستانێك یا بێشەلانێك کە لە بنچك و دەوەن پێك هاتبێت.
**copra** (kop′rə), ***n.*** گوێزی هیندی ووشك کراوە.
**copro- , copr-** (kop′rō, kop′rə), پێشگرێکە بەمانای: پیسایی.
**coprolite** (kop′rə-līt´), ***n.*** شیاکەی بەردەنی.
**coprology** (kop´rol′ə-ji), ***n.*** بەرەلایی لە وێژەو هونەرو وێنەی ڕووتدا (زاووزێ و جووت بوون)؛ وێژەو هونەرو وێنەی ڕووت.
**coprophagous** (kop-rof′ə-gəs), ***adj.*** لەسەر شیاکەو پیسایی ژیاو (قالۆنچە).
**copse** (kops), ***n.*** (١) لێکدەر؛ گەیەنەر؛ پەیوەندی.
(٢) ئێسقان یا کڕکڕاگە یا تێشووی لێکدەر.
(٣) کرداری لێکدەر (ڕێزمان): ( **is, are, am, was, were** ).
**-copular** *(adj.).*
**copulate** (kop′yoo-lāt´), ***v.i.*** جووت بوون؛ گاین.
**copulation** (kop´yoo-lā′shən), ***n.*** جووت بوون؛ گان کردن.
**copulative** (kop′yoo-lā´tiv, kop′yoo-lə-tiv), ***adj.*** (١) بەیەك گەیەنەر؛ لێکدەر. (٢) (ا) تایبەتی بە ئامرازی پەیوەندی کە دوو ڕستەی هاوتا بەیەك دەگەیەنێت. (ب) تایبەتی بە کرداری لێکدەر (ڕێزمان).
(٣) تایبەتی بە جووت بوون یا گاین.
***n.*** ووشەی لێکدەر.
**copy** (kop′i), ***n.*** (١) وێنەی دەقاودەق؛ وێنە؛ دەق.
(٢) دانە؛ دانەی هەمان گۆڤار، پەڕتووك، یا ڕۆژنامە:
*( He has two ~ies of that magazine.)*
(٣) نموونە؛ نموونەیەك کە وێنەی لەسەر دەربهێنرێت یا لاسایی بکرێتەوە.
(٤) دەستنووسێك کە ئامادەبێت بۆ چاپکردن.
(٥) باسێك کە نووسەر یا ڕۆژنامەنووس بتوانێت لەسەری بنووسێت
***v.t. & v.i.*** (١) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان؛ تۆمارکردن؛ نووسینەوە.
(٢) چاولێکردن؛ لاسایی کردنەوە.
(٣) قۆپیەکردن (تاقیکردنەوە)؛ لەبەر نووسینەوە.
**clean copy (or fair copy),** پاکنووس؛ وێنەی پاك.
**rough copy,** ڕەشنووس؛ گەڵاڵە.
**copybook** (kop′i-book´), ***n.*** (١) پەڕاوی خەتخۆشی: پەڕاوی-

ڕاهێنانی قوتابی لەسەر دەستوخەت خۆشی ئەویش بە لەبەر نووسینەوەی ئەو نموونانەی لە پەڕاوەکەدان. (٢) ئاسایی؛ سوواو؛ کۆن (ووتە).

**copy boy,** منداڵێکی بەردەست کە شتومەکی نووسراو لە نووسەرەکانەوە دەهێنێتو دەبات بۆ ڕۆژنامە.

**copycat** (kop′i-kat′), ***n.*** چاولێکەر؛ لاساییکەرەوە؛ دەمەلاسکێکەر.

**copy desk,** مێزی بژارکردنی ووتارو نووسینی سەرباسی ڕۆژنامەیەک پێش ناردنی بۆ چاپکردن.

**copyholder** (kop′i-hōl′dēr), ***n.*** کەسێکە کە دەستنووسێک بە دەنگی بەرز دەخوێنێتەوە بۆ ئەو کەسەی کە پوختە یا هەڵەبڕی دەکات.

**copyist** (kop′i-ist), ***n.*** (١) دەستنووسکەر؛ تۆمارکەر.
(٢) چاولێکەر؛ لاساییکەرەوە.

**copyreader** (kop′i-rē′dēr), ***n.*** هەڵەبڕکەری ووتاری ڕۆژنامە پێش چاپکردنی، هەڵەبڕکەر یا پوختەکەری ناوکرۆکی پەڕتووکێک پێش لەچاپدانی.

**copyright** (kop′i-rīt′), ***n.*** مافی چاپکردن (پەڕتووک)؛ ماف یا مافنامەی چاپکردنو بڵاوکردنەوەو فرۆشتنی پەڕتووک یا بەرهەمێکی هونەری یا مۆسیقایی یا شانۆگەری.
***adj.*** پارێزراوە بە مافی چاپکردن یا بڵاوکردنەوە.
***v.t.*** پاراستنی پەڕتووک یا بەرهەمێکی هونەری بە تۆمارکردنو دەرهێنانی مافنامەی چاپکردنو بڵاوکردنەوە لە دەزگای میری تایبەتیدا.

**coquet** (kō-ket′), ***v.i.*** (١) نازکردن؛ مەکرو نازونووزکردن؛ چاوباشقاڵی (ئافرەت). (٢) یاری پێکردن؛ وەک یاری دانەبەر (هەست).

**coquetry** (kō′kə-tri, kō-ket′ri), ***n.*** ناز؛ نازکردن؛ مەکرو ناز؛ چاوبازی.

**coquette** (kō-ket′), ***n.*** مەکرباز (ئافرەت)؛ نازونووزکەر؛ چاوباشقاڵ (ئافرەت).
***v.i.*** مەکربازی کردن؛ نازکردن؛ نازونووزکردن؛ چاوباشقاڵی کردن.

**coquettish** (kō-ket′ish), ***adj.*** بەناز؛ بە مەکر؛ بە نازونووز؛ مەکرباز.

**coquina** (kə-kē′nə), ***n.*** بەردێکە لە کونچکەماسیو شیلانی شکاو پێکدێت

**coracle** (kôr′ə-k'l, kor′ə-k'l), ***n.*** بەلەمێکی بچووکە وەک زەمیلە دروست دەکرێتو بە چەرم یا شتێکی تری ئاوبڕ دەوری دەگیرێت.

**coracoid** (kōr′ə-koid′, kor′ə-koid′), ***n.*** ئێسقانی نێوان دەفەی شانو چەلەمە (باڵندە، خشۆک، شیردەر).

**coral** (kôr′əl, kor′əl), ***n.*** (١) شیلان (دەریا)
(٢) گیاندارێکی ئاوییە کە ئێسکەکەی دەبێت بە شیلان؛ شیلان.
(٣) پارچەیەک شیلان (خشڵ). (٤) ڕەنگی سوور.
***adj.*** (١) شیلانی؛ لە شیلان دروستکراو.
(٢) شیلانی (ڕەنگ)؛ سوور یا پەمەیی: ***( ~ lips)*** .

**coralline** (kôr′ə-lin, kor′ə-līn′, ***n.*** (١) گیاندارێک کە لە شیلان بکات (٢) قەوزەی دەریایی کە بە ماددەیەکی گەچین دادەپۆشرێتو بەردەگەچی لێ دروست دەبێت.
***adj.*** (١) لە شیلان یا گیاندارو شتی شیلانی پێکهاتووە.
(٢) شیلانی (ڕەنگ)؛ سوور یا پەمەیی.

**coralloid** (kôr′ə-loid′, kor′ə-loid′), ***n.*** شیلانی (لە ڕەنگو توخمو ناوەڕۆکدا).

**coral red,** سوورێکی زەردباو

**coral reef,** ڕەفە یا تیرەی شیلانی (کە لە ئێسکی گەچینی شیلان دروست دەبێت).

**coral snake,** ماری شیلانی: مارێکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگی ژەهراوی ئەمەریکییە

**coranto** (kə-ran′tō), ***n.*** جۆرە سەمایەکە.

**corban** (kôr′bən, kôr-bän′), ***n.*** قوربانی

**corbeil** (kôr′bel), ***n.*** وێنەی زەمیلەیەک گوڵ یا میوە کە لە نەقشی خانوودا بەکاردەهێنرێت بۆ ڕازاندنەوە (خانووسازی).

**corbel** (kôr′b'l), ***n.*** گۆشەیەکی دار، بەرد، یا کانزایی کە سەر دەرپەهێنێت لە دیوارێکەوە بۆ ڕاگیرکردنی تاقێک، تارمە، یا باڵکۆنەیەک.
***v.t.*** ڕاگرتن بەم جۆرە گۆشەیە.

**corbie** (kôr′bi), ***n.*** [Scot.], قەلەڕەشکە.

**cord** (kôrd), ***n.*** (١) پەت؛ گوریس؛ پەتک؛ بەنی ئەستوور؛ تەل؛ ژێ؛ دەمار. (٢) پەتی هەڵواسین. (٣) پەیوەندی؛ هێزێکی یەکخەر.
(٤) پێوانەیەکی داری سووتاندنە کە بریتییە لە (١٢٨) پێ سێجا؛ لیژنەدارێکە پانیو قووڵی چوار پێیەو درێژیشی هەشت پێیە.
(٥) ئەندامێکی لەش کە لە ژێ، گوریس، یا پەت دەچێت (ئەشتەرگەری):
***( the spinal ~ ; vocal ~s ; umbilical ~ )***
(٦) (ا) هێڵێکی قەیتانی لە قوماشدا. (ب) قوماشێکی وەها.
(٧) ***(pl.)***، جۆرە پانتۆڵێک کە لەم قوماشە دروستکرابێت.
(٨) وایەری کارەبا (کە نەرمەو دەوری گیراوە بۆ سەلامەتیو پلاکێکی پێوەیە).
***v.t.*** (١) بەستن بە گوریس یا پەت
(٢) لیژنەکردنی داری سووتاندن بە پێوانەی (١٢٨) پێ سێجا.

**cordage** (kôr′dij), ***n.*** (١) گوریس (بەتایبەتی هی سەر کەشتی).
(٢) هەندێک داری سووتاندن کە بەش کرابێت بە لیژنە لیژنەی پێ سێجاوە.

**cordate** (kôr′dāt), ***adj.*** دڵ شێوە (گەڵا): ***( ~ leaves)*** .

**corded** (kôr′did), ***adj.*** (١) بە گوریس یا پەت بەستراو یا شەتەکدراو.
(٢) لە پەت یا گوریس دروستکراو. (٣) هێڵی قەیتانی تێدایە (قوماش).
(٤) لیژنەکراو (دار)؛ هەڵچنراو بە لیژنەی (١٢٨) پێی سێجا.

**cordial** (kôr′jəl, kôrd′yəl), ***adj.*** (١) گەرم (هەست)؛ بەدڵ؛ دڵسۆزانە: ***( a ~ reception; a ~ meeting)*** .
(٢) ووریاکەرەوە؛ هێزبەخش.
***n.*** (١) دەرمان یا خواردنەوەیەکی ووزەبەخش.
(٢) خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر.

**cordiality** (kôr′ji-al′ə-ti, kôr-jal′ə-ti), ***n.*** (١) گەرمی (هەست)؛ دڵسۆزی (هەست، کردەوە)؛ ڕووخۆشی.
(٢) کردەوەیەک یا هەست دەربڕینێکی دڵسۆزانە.

-cordially ***(adv.).***

**cordiform** (kôr′də-fôrm′), ***adj.*** دڵ شێوە.

**cordillera** (kôr-dil′ēr-ə, kôr′dil-yâr′ə), ***n.*** زنجیرە شاخ (بەتایبەتی زنجیرە شاخی سەرەکی کیشوەرێک).

**cordite** (kôr′dīt), ***n.*** تەقەمەنییەکی بێ دووکەڵە.

**cordless** (kôrd′lis), ***adj.*** بێ تەل: ***( ~ phone)*** .

**cordoba** (kôr′də-bə), ***n.*** کۆردەبە: دراوی نیکاراگوا.

**cordon** (kôr′d'n), ***n.*** (١) ڕیزێک یا زنجیرەیەک پۆلیس، سەرباز، یا پاپۆڕ کە ئابڵوقەی شوێنێک دەدەنو قەدەغەی هاتوچۆ دەکەن لەو شوێنەدا.
(٢) شریتێکی هۆنراوە یا قەیتانێک کە بەکاردەهێنرێت بۆ جوانی یا شت بەستن
(٣) شریتێک کە چەپو ڕاست لە سنگ دەدرێت (نیشانەی ڕێز یا جوانی).
(٤) ڕیزە بەرد یا خشت کە بۆ جوانی بەکاردەهێنرێت (خانووسازی).
***v.t.*** ( ~ off ), ئابڵوقەدانی شوێنێک بە هێزی پۆلیس، سوپا، یا دەریاییو قەدەغەکردنی هاتوچۆ بۆ ئەو شوێنە.

**cordon bleu** (kôr′dōn′ blö′), [Fr.], (١) نیشانەیەک کە بریتی بوو لە شریتێکی شین لە کۆندا بە سوارچاکی فەرەنسا دەبەخشراو لە خۆیان دەدا.
(٢) سوارچاکێک کە ئەم نیشانەیە لە خۆی دەدات.
(٣) (ا) ڕێزێکی زۆر؛ بەرزی؛ لێهاتوویی.
(ب) کەسێک کە لە پیشەو پسپۆڕی خۆیدا زۆر ناسراو بێت.

**cordovan** (kôr′də-vən, kôr-dō′vən), ***n.*** (١) چەرمێکی نەرمو چاکە لە پێستی مەڕ یا ئەسپ دروست دەکرێت.
(٢) ***(pl.)***، پێڵاوێک کە لەم چەرمە دروست کرابێت.
(٣) [C-]، دانیشتوویەکی شاری " قورتوبە " ی ئیسپانیا.
***adj.*** (١) [C-] ، تایبەتی بە شاری " قورتوبە " ی ئیسپانیا.
(٢) لە چەرمی " کۆردۆڤان " دروستکراو.

**corduroy** (kôr′də-roi′), ***n.*** (١) کوردەری؛ قوماشێکی لۆکەی ئەستووری نەرمە هێڵی قەیتانی ستوونی تێدایە.

(٢) (*pl.*). پانتۆڵی ئەم جۆرە قوماشە.
*adj.* لە کوودەری دروستکراو.
*v.t.* دروستکردنی ڕێگایەك بە دانانی بڕەدار بە پانی (بەتایبەتی بەناو زەلکاوێکدا)
**corduroy road,** ڕێگایەك کە بەناو زەلکاوێکدا دروست دەکرێت بە ڕیزکردنی بڕەدار لەسەر باری پانی.
**cordwainer** (kôrd′wān-ēr), *n.* (١) پێڵاودروو.
(٢) [Archaic]، کەسێك کە شت لە چەرمی " کۆردۆڤان " دروست دەکات.
**cordwood** (kôrd′wood′), *n.* (١) داری سووتەمەنی کە بە لیژنەی (١٢٨) پێی سێجا، واتە بە " کۆرد " لیژنە دەکرێت و دەفرۆشرێت.
(٢) داری سووتاندن کە بە درێژی چوار پێ دەبڕرێتەوە.
**core** (kôr, kōr), *n.* (١) ناوك (سێو، هەرمێ)؛ دەنك (قۆخ).
(٢) ناوەڕۆك: *( the ~ of the subject; the ~ of our policy)* .
(٣) ناوەڕاست؛ ناوکرۆك: *( the ~ of an electromagnet)* .
(٤) ناوجەرگەکەی؛ مۆخەکەی: *( He is English to the ~ .)* .
(٥) کۆمەڵێك لم کە لە ناوەڕاستی قاڵبێکدا دادەنرێت بۆئەوەی قاڵبەکە دەرچێت.
*v.t.* ناوك یا دەنك لێ دەرهێنان: *( to ~ an apple)* .
**-corelate** *(v.t.)*; **corelation** *(n.)*.
**coreligionist** (kō′ri-lij′ən-ist), *n.* هاوئاین؛ برای ئاینی.
**corer** (kôr′ēr, kōr′ēr), *n.* ئامێری دەرهێنانی ناوکی سێو.
**corespondent** (kō′ri-spon′dənt), *n.* گومانباری داوێن پیسی؛ کەسێك (ژن یا پیاو) کە لە دادگادا گومانبارە بە داوێن پیسی لەگەڵ مێرد یا ژنی کەسێکی تر لە داوای تەڵاقدا.
**corf** (kôrf), *n.* (١) زەمبیلە؛ بەرچنە
(٢) عەرەبانەی خەڵووزو کانزا گواستنەوە لە کانگادا.
**coriaceous** (kō′ri-ā′shəs, kor′i-ā′shəs), *adj.* وەك چەرم؛ جیڕ.
**Corinthian** (kə-rin′thi-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە " کۆرنس " کە بەشێکە لە یۆنان و هاووڵاتییان و کلتوورەکەی. (٢) سەرسەری و کەیفباز (وەك دانیشتووانی کۆنی " کۆرنس " ی یۆنان). (٣) لەسەر شێوازی هونەری " کۆرنس " ی کۆن جوان و ڕازاوە (خانووسازی، وێژە... هتد).
*n.* (١) هاووڵاتییەکی " کۆرنس " ی کۆن (لەڕووی سەرسەرێتییەوە).
(٢) پیاوێکی دەوڵەمەند کە هەر لە کەیف بگەڕێت. (٣) یەختچی.
(٤) حەز لە وەرزش کەر بەتایبەتی بۆکسبازی و ئەسپ سواری.
**corium** (kôr′i-əm, kō′ri-əm), *n.* ژێر پێست؛ دیوی ژێر پێست.
**cork** (kôrk), *n.* (١) توێکڵەداری تەپەدۆر. (٢) تەپەدۆر؛ تۆپەوانە.
(٣) تۆپەوانەی شووشە یا لاستیك.
*adj.* تەپەدۆری؛ لە تەپەدۆر دروستکراو.
*v.t.* (١) دەم داخستن یا ئاخنەوە بە تەپەدۆر.(٢) پەستنەوە؛ ڕاگرتن.
(٣) ڕەش کردن بە تەپەدۆری سووتاو.
**corkage** (kôr′kij), *n.* ئەو پارەیەی خاوەنی چێشتخانە یا ئوتێل دەیسەنێت لە هەقی هەڵپچڕینی تەپەدۆری شووشەی مەی یا خواردنەوەی تر کە لەدەرەوەی چێشتخانەکە یا ئوتێلەکە کڕابێت.
**corked** (kôrkt), *adj.* (١) بە تەپەدۆر دەمەکەی داخراوە (شووشە).
(٢) ڕەش کراو بە تەپەدۆری سووتاو. (٣) تامی تەپەدۆری گرتووە (بە جۆرێك مەی دەووترێت کە بە تەپەدۆری خراپ سەری ئرابێتەوە).
**corker** (kôr′kēr), *n.* (١) کرێکار یا ئامێرێك کە شووشە بە تەپەدۆر دادەخات (٢) [Slang]، کەسێکی زۆر لێهاتوو؛ شتێکی نایاب.
(٣) [Slang]، دوا ووتە (مشتومڕ، لێکۆڵینەوە)؛ ووتە یا ڕاستییەك کە کۆتایی بە مشتومڕێك دەهێنێت و دەیبڕێتەوە چونکە بەرپەرچی نادرێتەوە.
(٤) [Slang]، درۆیەکی بێ مانا؛ درۆیەك کە نەچێت بە مێشکدا.
**corking** (kôr′kiŋ), *adj. & interj.* [Slang], نایاب.
**corkscrew** (kôrk′skrōō′), *n.* تەپەدۆرهەڵپچڕ؛ شووشەهەڵپچڕ.
*adj.* پێچ لوول.
*v.i. & v.t.* بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ بە پێچ پێچ ڕۆیشتن.
**corkwood** (kôrk′wood′), *n.* (١) درەختێکە کە قەدەکەی سووك و کونیلەدارە وەك تەپەدۆر. (٢) داری ئەم جۆرە درەختە.
**corky** (kôr′ki), *adj.* (١) تەپەدۆری؛ وەك تەپەدۆر؛ لە تەپەدۆر دەچێت.
(٢) بەکەیف. (٣) سووك. (٤) تامی تەپەدۆر دەدات (شەراب).
**corm** (kôrm), *n.* سەلك؛ ڕەگی هەندێك ڕووەك کە لە سەلکە پیاز دەچێت.
**cormorant** (kôr′mə-rənt), *n.* (١) باڵندەیەکی دەریایی گەورەی زۆرخۆری چاوبرسی قاچ تەنراوە توورەکەیەکی وەك چەرم بەژێر دەنووکییەوەیە ماسی تێدەکات. (٢) کەسێکی چاوبرسی؛ کەسێکی چڵێس و تێرنەخۆر.
*adj.* چڵێس؛ چاوبرسی؛ تێرنەخۆر.
**corn** (kôrn), *n.* (١) گەنمەشامی؛ شامی.
(٢) دەنگ (جۆ، گەنم، گەنمەشامی... هتد)؛ دەنکی هەموو دانەوێڵەیەك
(٣) گەنم (لە ئینگلتەرە).
(٤) جۆرە دانەوێڵەیەکە لە جۆ دەچێت (سکۆتلەندە و ئێرلەندە).
(٥) [Colloq.]، ویسکی گەنمەشامی.
(٦) [Slang]، بیروباوەڕ، نوکتە، یا مۆسیقای کۆن و بێ تام و سوواو.
*v.t.* (١) خڕبوون وەك دەنکە دانەوێڵە؛ بوون بە دەنك.
(٢) پاراستنی گۆشت بە سوێرکردنی؛ قاورمەکردن: *( ~ed beef)*
(٣) ئالیك دان بە وڵاخ.
**corn** (kôrn), *n.* مێخەکە؛ بزمارە (پەنجەی پێ).
**-corn** (kôrn), پاشگرێکە بەمانای: شاخ (گیانداری یەك شاخ): *( unicorn)*
**corn borer,** کرمۆکەی مۆرانەیەکە لە گەنمەشامی و دانەوێڵەی تر دەدات.
**corn bread,** نانی گەنمەشامی.
**corncob** (kôrn′kob′), *n.* کۆتەرەی گوڵە گەنمەشامی بەبێ گەنمەشامییەکە.
**corn cockle,** گیایەکی گوڵ مۆرە لە کێڵگەی گەنمەشامیدا دەڕوێت.
**corncrib** (kôrn′krib′), *n.* عەماری هەواکێشی گەنمەشامی.
**corndodger** (kôrn′doj′ēr), *n.* کێکی ئاردە گەنمەشامی.
**cornea** (kôr′ni-ə), *n.* کۆرنیای چاو: کە بەرگی دەرەوەی سپێنەی چاو پێکدێنێت و بیلبیلەی چاو دادەپۆشێت.
**corned** (kôrnd), *adj.* لە خوێ یا خوێیاوکدا پارێزراوە (گۆشت).
**cornel** (kôr′n'l, kôr′nel), *n.* درەختێکی دار ڕەقی گوڵ گرە.
**cornelian** (kôr-nēl′yən, kēr-nēl′yən), *n.* بەردێکی بەنرخی سوورە.
**corneous** (kôr′ni-əs), *adj.* لە شاخ دروستکراو؛ پتەو؛ ڕەق.
**corner** (kôr′nēr), *n.* (١) گۆشە؛ سووچ: *( the ~ of a room)* .
(٢) سووچ؛ شوێنی بەیەککەیشتنی دوو شەقام یا ڕێگە. (٣) گۆشە (ڕەفە).
(٤) کون و قوژبن؛ کونج؛ پەنا: *( Look in every nook and ~ )* .
(٥) چوار قوڕنەی جیهان؛ ناوچە: *( the four ~s of the world)* .
(٦) هەڵوێستێکی شلۆق: *( He was driven into a ~ .)* .
(٧) چمك (کراس، چاکەت، پانتۆڵ).
(٨) تیلەی چاو: *( He saw her from the ~ of his eye.)* .
(٩) قۆرخ؛ قۆرخ کردن.
*v.t.* (١) گۆشەگیرکردن. (٢) خستنە قوژبنەوە؛ لە سووچدا دانان.
(٣) تەنگ پێ هەڵچنین؛ گەمارۆدان؛ بەگیرهێنان:
*( They ~ed him.; Don't ~ him.; If you ~ him, he will react violently.)*
(٤) قۆرخ کردن.
*v.i.* (١) بوون بە گۆشە. (٢) لە قوژبندا بوون؛ لەسەر سووچێکدا بوون.
*adj.* (١) لەسەر سووچدایە؛ لەسەر سووچی دوو شەقامدایە: *( a ~ store)* .
(٢) لە گۆشە یا قوژبندا بەکاردەهێنرێت.
**a tight corner,** بارێکی ناخۆش و گران؛ هەڵوێستێکی پڕ لە مەترسی.
**cut corners,** (١) ڕێی ڕاستەوخۆ گرتن.
(٢) لە کات و پارە و ئەرك کەمکردنەوە (دروستکردنی شتێك، گوزەران... هتد)
(٣) گزی کردن.
**drive (put) a person into a corner,** تەنگ پێ هەڵچنین؛

گەماروٚدان؛ بەگیرهێنان.

**the (four) corners of the world,** (١) چوار قوڕنەی جیهان؛ دوورترین شوێنی سەرزەوی. (٢) هەموو شوێنێك.

**turn the corner,** ڕزگاربوون لە تەنگوچەڵەمە؛ کەوتنەسەر ڕێی تازە.

**cornered** (kôr′nērd), *adj.* (١) گۆشەدار.
(٢) تەنگ پێ هەڵچنراو؛ گەمارۆدراو؛ بەگیرهێنراو.

**cornerstone** (kôr′nēr-stōn´), *n.* (١) بەردی بناغە؛ بنچینە:
*( Hard work was the ~ of his success.)*
(٢) گرنگترین بەشی شتێك یا کردارێك.

**cornerways** (kôr′nēr-wāz´), *adv.* = cornerwise.

**cornerwise** (kôr′nēr-wīz´), *adv.* (١) بە جۆرێك کە گۆشەکەی لەپێشەوە بێت. (٢) بە لابەلایی؛ چەپو ڕاست.

**cornet** (kôr-net′), *n.* (١) کەڕەنا: ئامێرێکی مۆسیقایە.
(٢) پارچەیەك کاغەز کە وەك قووچەکی لێ دەکرێت و چەرەس و شەکرو نوقڵی تێ دەکرێت؛ دەفرێکی قووچەکییە کە لە شتێکی شیرینی تەنك وەك بسکویت دروستکراوە دۆندرمەی تێ دەکرێت و دەفرەکە خۆیشی دەخورێت.
(٣) ئەفسەری سوارەی ئاڵاهەڵگر (سوپای ئینگلیزی).

**cornetcy** (kôr′nit-si), *n.* پلەی ئەفسەری سوارەی ئاڵاهەڵگر (سوپای-ئینگلیزی).

**cornettist, cornetist** (kôr-net′ist), *n.* کەڕەناژەن.

**cornfed** (kôrn′fed´), *adj.* (١) لەسەر گەنمەشامی دەژی؛ دابەستەی گەنمەشامی. (٢) [Slang]، لادێیی؛ تەندرووست و بەهێز بەڵام تێنەگەیشتوو.

**cornfield** (kôrn′fēld´), *n.* کێڵگەی گەنمەشامی.

**cornflour** (kôrn′flou´ēr, kôrn′flour´), *n.* ئاردی گەنمەشامی.

**cornflower** (kôrn′flou´ēr), *n.* ڕووەکێکە گوڵی شین و مۆرو سوورو سپی دەگرێت

**cornhusk** (kôrn′husk´), *n.* گەڵا و توێکی گوڵە گەنمەشامی.

**cornhusking** (kôrn′hus´kiŋ), *n.* (١) لێکردنەوەی گەڵا و توێکی گوڵە گەنمەشامی. (٢) هەرەوەزی دۆست و دراوسێ بۆ لێکردنەوەی گەڵا و توێك لە گوڵە گەنمەشامی (هەروەها پێشی دەوترێ: " husking bee ").

**cornice** (kôr′nis), *n.* (١) پارچەیەك بەرد یا داری درێژکۆلەی نەقشکراوە کە بۆ جوانی دەدرێت لە شوێنی بەیەکگەیشتنی دیوارو بنمیچ یا وەك لێواری خانووەکە سەر دەردەهێنێت بە چواردەوری سەربانەکەدا (خانووسازی).
(٢) شتێکی نەقشداری جوانی دار یا بەردە کە شتی وەك شیش و پەردەو سنگی ئاومالی پێ دادەپۆشرێت.

**corniculate** (kôr-nik′yoo-lāt´, kôr-nik′yoo-lit), *adj.* وەك شاخ سەردەرهێنەر؛ شاخدار.

**corn meal,** (١) ئاردی زبری گەنمەشامی.
(٢) خواردەمەنییەك کە لە گەنمەشامی دروستکرابێت.
(٣) خواردەمەنییەك کە بە دانەوێڵەی وەك گەنم دروستکرابێت.

**corn picker,** مەکینەی ڕنین و لێکردنەوەی توێك و گەڵای گوڵە-گەنمەشامی.

**corn pone,** نانی گەنمەشامی.

**corn poppy,** خەشخاش؛ خەشخاشی ناو کێڵگەی گەنمەشامی.

**corn rose,** (١) خەشخاش؛ خەشخاشی ناو کێڵگەی گەنمەشامی.
(٢) گیایەکی گوڵ مۆرە لە کێڵگەی گەنمەشامیدا دەڕوێت.

**corn silk,** ڕیشاڵی گوڵە گەنمەشامی.

**corn stalk,** لاسك یا قەدی گەنمەشامی؛ قەفی ڕووەکی گەنمەشامی.

**corn starch,** ئاردی زۆر ووردی گەنمەشامی؛ نیشاستەی گەنمەشامی.

**cornu** (kôr′nū), *n.* (١) شاخ؛ کەڵەشاخ. (٢) شتێك کە لە شاخ بچێت.

**cornuted** (kôr-nū′tid), *adj.* (١) لە شاخ دەچێت. (٢) شاخدار.
(٣) [Archaic]، ژن هەڵگیراو؛ ژن گایراو (بەگوێرەی ئەفسانەی ڕۆمانەکان ئەو پیاوەی ژنەکەی ناپاکی لەگەڵ بکات شاخی لێ دەڕوێت).

**corn whisky,** ویسکی گەنمەشامی.

**corny** (kôr′ni), *adj.* (١) گەنمەشامی دەهێنێتە بەرهەم.
(٢) [Slang]، لادێیی؛ سادەو ڕەشۆکی و نەزان.
(٣) [Slang]، کۆنباو و بێ تام و سوواو (نوکتە، مرۆڤ، ووتە).

**corny** (kôr′ni), *adj.* تایبەتی بە مێخەکە یا بزمارەی پێ.

**corolla** (kə-rol′ə), *n.* پەڕەی گوڵ؛ کۆپەرەی گوڵ؛ پەڕەکانی ناوەرەی گوڵ کە دەوری ئەندامی نێرەکی گوڵ دەدەن.

**corollary** (kôr′ə-ler´i, kor′ə-ler´i), *n.* (١) بەڵگەنەویست؛ شتێکی بەڵگەنەویست (بیرکاری).
(٢) ئەنجام؛ شتێکی پێوەبەستراو یا بەندبوو:
*( Improved health is a ~ of physical exercise.)*
*adj.* ئەنجام.

**corona** (kə-rō′nə), *n.* (١) تاج؛ شتێکی خڕ (وەك تاج)؛ گوڵبەند.
(٢) چل چرایەکی خڕ لە کڵێسەیەکدا. (٣) سیگارێکی هەردوو سەر خڕ.
(٤) سەری ددان یا کاسەی سەر؛ ئەندامێکی خڕ (توێکاری).
(٥) (ا) خەرمانە؛ شەوقێکی بازنەییە کە بەدەوری ڕۆژدا دەبینرێت لەکاتی خۆرگیراندا. (ب) خەرمانە؛ شەوقی دەوری ڕۆژو مانگ (ئەستێرەناسی)
(٦) ئەو بەشە خڕەی هەندێك گوڵ کە کۆپەڕەکانی گوڵەکە دەوریان داوە.

**coronach** (kôr′ə-nəkh, kor′ə-nəkh), *n.* (١) [Scot.]، لاوانەوە یا شیوەن کە بە زوڕنای سکۆتلەندی یا ئێرلەندی لێ دەدرێت.
(٢) [Irish]، شیوەن؛ شینی مردوو.

**coronal** (kôr′ə-n'l, kor′ə-n'l), *adj.* (١) تایبەتی بە کڵاوی زێڕین یا خەرمانەی بازنەیی بەدەوری ڕۆژدا لەکاتی خۆرگیراندا.
(٢) تایبەتی بە تەوقەسەر.

**coronary** (kôr′ə-ner´i, kor′ə-ner´i), *adj.* (١) لە شێوەی کڵاوی زێڕیندا؛ وەك کڵاوی زێڕین؛ تایبەتی بە کڵاوی زێڕین. (٢) تایبەتی بە دڵ.
(٣) دەورەدەر (وەك ئەو دوو دەمارەی خوێن دەهێنن بۆ دڵ).
(٤) تایبەتی بەو دوو دەمارە.
*n.* مەیینی خوێن لە یەکێك لەو دەمارانەی خوێن دەهێنن بۆ لەش وە داخستنی دەمارەکە.

**coronary thrombosis,** مەیینی خوێن لە یەکێك لەو دوو دەمارانەی خوێن دەهێنن بۆ لەش وە داخستنی دەمارەکە.

**coronation** (kôr´ə-nā′shən, kor´ə-nā′shən), *n.* چوونە سەر تەخت (پاشایەتی)؛ تاج خستنەسەر سەری شا یا شاژن؛ ئاهەنگی چوونە سەر تەختی پاشایەتی.

**coroner** (kôr′ə-nēr, kor′ə-nēr), *n.* توێکارکەری لاشەی مردوو بۆ دۆزینەوەی هۆی مردنەکەی.

**coronet** (kôr´ə-net′, kor′ə-nit), *n.* (١) کڵاوێکی زێڕینی بچووکە لە هی شاو شاژن بچووکترە میرەکان لەسەری دەکەن؛ تاجی بچووك.
(٢) فێستی ژن کە خشڵ و پێڵپڵەی پێوەدەکرێت.
(٣) بازنەی بەشی ژووروی سمی ئەسپ و ماین.

**corporal** (kôr′pēr-əl), *n.* سەربازی سێ خەت؛ عەریفی سوپا.

**corporal** (kôr′pēr-əl), *adj.* (١) لەشی؛ تایبەتی بە لەش:
*( ~ punishment)*
(٢) کەسی؛ خۆیی؛ تایبەتی بە کەسێك.
(٣) [Archaic]، دیاردە؛ بە چاو بینراو یا دەست لێدراو؛ بەرجەستە.

**corporal** (kôr′pēr-əl), *n.* پارچە قوماشێکی سپییە دەدرێت بەسەر قوربانیگادا لە کڵێسەداو نان و شەرابی پیرۆزکراوی دەخرێتە سەر.

**corporality** (kôr´pə-ral′ə-ti), *n.* دیاردەبوون؛ بەرجەستەیی.

**corporal punishment,** سزای لەشی (وەك فەلاقەکردن)؛ لێدان.

**corporate** (kôr′pēr-it), *adj.* (١) یەککگرتوو؛ یەك.
(٢) بەشکەیی؛ تایبەتی بە بەشکە: *( ~ property)*.
(٣) هاوبەشی؛ ئاوکۆیی: *( ~ responsibility)*.

-corporately *(adv.).*

**corporation** (kôr´pə-rā′shən), *n.* (١) کۆمپانیای هاوبەش؛ کۆمپانیای بەش بەش؛ بەشکە. (٢) ئەنجوومەن و سەرۆکی شارەوانی.
(٣) یەکێتی کرێکاران یا خاوەن کاران؛ ڕێکخراوێکی ڕامیاری و ئابووری.

(٤) [Colloq.]، وورگێکی زل.

**corporative** (kôr′pə-rā′tiv, kôr′pēr-ə-tiv), *adj.* بەشگەیی؛ سەندیکایی.

**corporator** (kôr′pə-rā′tēr), *n.* ئەندامی کۆمپانیایەکی هاوبەشی یا سەندیکایەك؛ بەشداری بەشگەیەك.

**corporeal** (kôr-pôr′i-əl, kôr-pō′ri-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە لەش یا تەن؛ لەشی؛ تەنی. (٢) دیاردە؛ هەستپێکراو؛ بەرجەستە.

**corposant** (kôr′pə-zant′), *n.* چرای سەر تەوقەسەری کڵێسە یا تەوەری کەشتییەك.

**corps** (kôr, kōr), *n.* (١) (ا) دەستە لەشکر.
(ب) لقێکی سوپا کە ئەرکێکی تایبەتی دەبینێت (وەك ئەندازیاری):
*( the army ~ of engineers)*
(٢) (ا) دەستە (وەك دەستەی دیبلۆماسی): *( the diplomatic ~ )*.
(ب) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ: *( the peace ~ )*.

**corpse** (kôrps), *n.* (١) لاشە؛ لاشەی کەسێکی مردوو.
(٢) [Obs.]: لەش (مردوو بێت یا زیندوو)

**corpsman** (kôr′mən, kōr′mən), *n.* سەربازێکی دەریایی برینپێچ.

**corpulence** (kôr′pyoo-ləns), *n.* قەڵەوی؛ قەڵەوێتی.

**corpulent** (kôr′pyoo-lənt), *adj.* قەڵەو؛ گۆشتن.

**corpus** (kôr′pəs), *n.* (١) لاشە؛ لاك؛ لاشەی مردوو (مرۆڤ یا گیاندار).
(٢) سەرجەمی بەرهەمی نووسەرێك یا نووسراوەکان دەربارەی باسێك (وەك: یاسا، مێژوو... هتد): *( the ~ of civil law)*.
(٣) بەشی سەرەکی ئەندامێکی لەش (توێکاری).
(٤) دەستمایە؛ مایە.

**corpus callosum,** ئەو تێشووە دەزوولەیییانەی کە هەردوولای مێشك پێکەوە دەبەستن (توێکاری)

**corpuscle** (kôr′pəs-'l, kôr′pus-'l), *n.* (١) شانەیەکی زۆر ووردی زیندوو؛ گەردیلە (٢) خڕۆکەی سوورو سپی خوێن (توێکاری): *( blood ~ )*.
-corpuscular *(adj.)*.

**corpuscule** (kôr-pus′kūl), *n.* = corpuscle.

**corpus delicti,** (١) سەرجەمی ئەو بەڵگانەی کە دەیسەلمێنێت کوشتنێك ڕوویداوە. (٢) لاشەی کەسێکی کوژراو؛ لاشەی کوژراوێك.

**corpus juris,** سەرجەمی یاسای وولاتێك.

**corral** (kə-ral′), *n.* (١) تەویلە؛ پەچە.
(٢) ڕاگرتنی عەرەبانە بەدەوری شوێنێکدا وەك سەنگەر بۆ پاراستن.
*v.t.* (١) خستنە تەویلەوە؛ کردنە پەچەوە
(٢) کۆکردنەوە (وولاخی بەرزە، ڕەشەوولاخ... هتد)؛ گردکردنەوە.
(٣) دەورەدانی شوێنێك بە عەرەبانە بۆ پاراستنی.
(٤) [Slang]. گرتن؛ گرتنەوە؛ دەست بەسەردا گرتن.

**corrasion** (kə-rā′zhən), *n.* داخوران و ڕاماڵینی زەوی بە ئاوی خوڕو ئەو شتانەی تێیدایە وەكووردەبەردو زیخ و شتی تری زبر.

**correct** (kə-rekt′), *v.t.* (١) (ا) ڕاستکردنەوە؛ هەڵە چاکردن؛ بژارکردن
*( The teacher ~ed my pronounciation and composition.)*
(ب) ڕاستکردنەوە؛ جووت کردن لەگەڵ پێوانەیەکی تایبەتیدا:
*( C~ your watch by the station clock.)*
(٢) سەرزەنشت کردن؛ سزادان؛ هێنانەسەر ڕێی ڕاست:
*( to ~ a child for disobedience)*
(٣) چارەسەرکردن؛ چاکردنەوە؛ چاکردن.
*adj.* (١) ڕاست؛ تەواو؛ بێ هەڵە:
*( a ~ answer; the ~ time; a ~ calculation)*
(٢) درووست؛ بەجێ؛ ڕاست؛ گونجاو؛ جوان (ڕەفتار):
*( What is the ~ dress for a wedding?; ~ behavior)*

**correction** (kə-rek′shən), *n.* (١) ڕاستکردنەوە؛ چاکردنەوە؛ هەڵەبڕکردن. (٢) ڕاستی (کە جێی هەڵە دەگرێتەوە)؛ چاکبوون.
(٣) سەرزەنشت کردن؛ سزادان.
(٤) هەندی لێ دەرکراو یا خراوەسەر (بە مەبەستی ڕاستکردنەوەیەك).
-correctional *(adj.)*.
house of correction, بەندیخانە (بەتایبەتی هی هەرزەکارو منداڵان).

**correctitude** (kə-rek′tə-tōōd′, kə-rek′tə-tūd′), *n.* ڕەفتار- جوانی؛ پەرووشت چاکی.

**corrective** (kə-rek′tiv), *adj.* ڕاستکەرەوە؛ چارەسەری؛ چاککەرەوە:
*( ~ measure; ~ shoes)*
*n.* شتێکی چارەسەرکەر؛ چارەسەر.

**corrector** (kə-rek′tēr), *n.* ڕاستکەرەوە (مرۆڤ، ئامێر، شت).

**correlate** (kôr′ə-lāt′, kor′ə-lāt′), *n.* یەکێك لە دوو شتی پەیوەندیدار (بەتایبەتی کە یەکێکیان ئەوی تریش بگەیەنێت).
*adj.* پەیوەندیدار.
*v.t.* لێکدان؛ پەیوەندیدارکردن:
*( C~ the findings of psychology with those of sociology.)*
*v.i.* پەیوەندیداربوون؛ پەیوەندی بوون:
*( How does what you say ~ with what he says?)*

**correlation** (kôr′ə-lā′shən, kor′ə-lā′shən), *n.* (١) پەیوەندی نزیك:
*( There is a close ~ between climate and crops.; the ~ between illiteracy and prejudice)*
(٢) پلەی لەیەکچوون لەنێوان دوو شتدا: *( a ~ of 75 per cent)*
(٣) پەیوەندیدارکردن؛ پەیوەندبوون.

**correlative** (kə-rel′ə-tiv), *adj.* (١) پەیوەندیدار؛ پێکەوە بەستراو.
(٢) پەیوەندی دەربڕ (ڕێزمان).
*n.* (١) شتێکی پەیوەندیدار بە شتێکی ترەوە. (٢) ووشەی پەیوەند

**correspond** (kôr′ə-spond′, kor′ə-spond′), *v.i.* (١) گونجان؛ لەگەڵ ڕێکەوتن: *( The house ~s with my needs.)*.
(٢) هاوتابوون؛ بەرامبەربوون؛ لەیەکچوون:
*( The American Congress ~s to the British Parliament.)*
(٣) نامە گۆڕینەوە؛ نامە نووسین و وەڵام وەرگرتنەوە بەڕێكوپێکی:
*( We ~ regularly.; Would you like to ~ with her?)*

**correspondence** (kôr′ə-spon′dəns, kor′ə-spon′dəns), *n.* (١) گونجان؛ لەگەڵ گونجان؛ لەگەڵ ڕێکەوتن.
(٢) هاوتایی؛ بەرامبەری؛ لەیەکچوون.
(٣) نامە گۆڕینەوە؛ نامە نووسین و وەڵام وەرگرتنەوە بەڕێكوپێکی.
(٤) سەرجەمی نامەی نووسراو و نێردراو یا وەرگیراو.

**correspondence course,** خوێندن لەڕێگەی نامەگۆڕینەوە: بریتییە لە زنجیرەیەك وانەو تاقیکردنەوە کە قوتابی دوور لە شوێنی خوێندنەکە دەیان خوێنێت و تاقیکردنەوەیان لەسەر دەدات.

**correspondence school,** قوتابخانەی خوێندن لەڕێگەی نامە- گۆڕینەوەوە (ووشەی پێشوو ببینە).

**correspondency** (kôr′ə-spon′dən-si, kor′ə-spon′dən-si), *n.* = correspondence.

**correspondent** (kôr′ə-spon′dənt), *adj.* (١) گونجاو؛ لەگەڵ ڕێکەوتوو. (٢) بەرامبەر؛ هاوتا؛ لەیەکچوو.
*n.* (١) شتێکی هاوتا. (٢) (ا) نامەگۆڕەرەوە؛ کەسێك کە نامە دەنووسێت بۆ کەسێکی ترو وەڵامی لێ وەردەگرێتەوە بەڕێكوپێکی. (ب) نامەنووس بۆ گۆڤار یا ڕۆژنامە. (٣) پەیامنێر (ڕۆژنامە، گۆڤار، رادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ ڕاپۆرتچی.
(٤) بانق، مرۆڤ، یا دەزگایەکی بازرگانی کە پەیوەندی بازرگانی ڕێكوپێکی هەیە لەگەڵ یەکێکی تردا بەتایبەتی لە وولاتێکی بێگانەدا.

**corresponding** (kôr′ə-spon′diŋ, kor′ə-spon′diŋ), *adj.* (١) هاوتا (بیرکاری)؛ هاوجێ؛ گونجاو. (٢) هاوتا؛ بەرامبەر؛ لەیەکچوو.
(٣) پەیامنێر؛ نامەنووس.

**corridor** (kôr′ə-dēr, kor′ə-dēr), *n.* (١) ڕاڕەو؛ داڵان.
(٢) ڕێڕەو یا گوزەرێك کە وولاتێکی بە ووشکانی دەورەگیراو دەگەیەنێت بە بەندەرێك وە بەناو وولاتێکی بێگانەدا تێپەڕ دەبێت.

**corrie** (kôr′i, kor′i), ***n.*** [Scot.], ئەشکەوت؛ بۆشایی یا کەلەبەرێکی گەورە بە قەدپاڵێکەوە.

**Corriedale** (kôr′i-dāl′, kor′i-dāl′), ***n.*** مەڕی کۆریدالی جۆرە مەڕێکی گەورەی دەموچاو سپی نیوزیلەندییە بۆ خوریو بەرخەکەی بەخێو دەکرێت

**corrigendum** (kôr′i-jen′dəm), ***n.*** (١) هەڵەی چاپی ڕاستکراوە لە کۆتایی پەرتووکێکدا. (٢) (*pl.*)، لیستەی ئەو هەڵە چاپییانەی کە ڕاست کراونەتەوە لە کۆتایی پەرتووکێکدا.

**corrigible** (kôr′i-jə-b'l, kor′i-jə-b'l), ***adj.*** ڕاست دەکرێتەوە؛ دەتوانرێت بهێنرێتەوە سەر ڕێی ڕاست (مرۆڤ).

**-corrigibility** ***(n.)***; **corrigibly** ***(adv.)***.

**corrival** (kə-rī′v'l), ***n.*** هاوچاو: کەسێکی هاوچاو.

***adj.*** هاوچاو: هاوچاویکەر.

***v.t.*** هاوچاوی کردن.

**corroborant** (kə-rob′ə-rənt), ***adj.*** (١) ووزەبەخش (دەرمان) (٢) پاڵپشتکەر

***n.*** (١) دەرمانێکی ووزەبەخش. (٢) ڕاستی یا ڕووداوێکی پاڵپشتکەر.

**corroborate** (kə-rob′ə-rāt′), ***v.t.*** بەهێزکردن؛ چەسپاندن؛ پشتگیری کردن: ***( to ~ a theory; The evidence ~s his story.)***.

**-corroborator** ***(n.)***.

**corroboration** (kə-rob′ə-rā′shən), ***n.*** (١) بەهێزکردن؛ چەسپاندن؛ پشتگیری کردن (بەڵگە). (٢) شتێکی بەهێزکەر یا پاڵپشتیکەر.

**corroborative** (kə-rob′ə-rā′tiv, kə-rob′ēr-ə-tiv), ***adj.*** ***Also*** **corroboratory**, بەهێزکەر؛ پاڵپشتیکەر (ڕووداو، بەڵگە).

**corroboree, corrobori** (kə-rob′ēr-i), ***n.*** (١) ئاهەنگو- زەماوەندێکی گەورەیە کە دانیشتووە نیمچە کێوییەکانی ئوسترالیا بە شەو دەیگێڕن بەبۆنەی سەرکەوتن لە جەنگو ڕووداوی خێڵەکی گرنگی تر. (٢) ئاهەنگو زەماوەندێکی گەورە.

**corrode** (kə-rōd′), ***v.t.*** (١) داڕزاندن؛ داخوران (تێزاب، ژەنگ): ***( Rust ~s iron.)*** (٢) خورانەوە (کینە، ڕق)؛ تێکوپێکدان (مەجازی).

***v.i.*** داخوران: داڕزان؛ تێکچوون: ***( Iron ~s unless it is kept clean.)***.

**corrosion** (kə-rō′zhən), ***n.*** (١) داخوران؛ داڕزین؛ خورانەوە. (٢) ژەنگ

**corrosive** (kə-rō′siv), ***adj.*** (١) داڕزێنەر؛ ژەنگ هەڵهێنەر (٢) فەوتێنەر (مەجازی)؛ زیانبەخش.

***n.*** شتێکی داڕزێنەر (وەك ژەنگ، تێزاب)

**corrugate** (kôr′ə-gāt′, kor′yoo-gāt′), ***v.t.*** چرچولۆچ کردن؛ چرچ کردن: ***( to ~ the forehead)***.

***v.i.*** چرچ بوون؛ چرچولۆچ بوون

***adj.*** چرچولۆچاوی؛ چرچاوی؛ چرچ

**corrugated** (kôr′ə-gāt′id, kor′yoo-gāt′id), ***adj.*** چرچاوی؛ چرچولۆچاوی؛ چرچولۆچ تێکراو بەدەسەنقەست.

**corrugated iron,** تەبەقە ئاسنی چرچولۆچ کراو بەدەسەنقەست بۆ بەهێزکردنی کە بەکاردەهێنرێت بۆ پەرژین یا سەربانی خانووی هەرزانبەها.

**corrugated paper** (or **cardboard**), مقەبا یا کاغەزی ئەستووری پێچ پێچ کراو بۆ پێچانەوەی شتی ناسك.

**corrugation** (kôr′ə-gā′shən, kor′ə-gā′shən), ***n.*** (١) چرچو لۆچ کردن؛ چرچولۆچ بوون. (٢) لۆچ؛ چرچ (تەبەقە ئاسن، مقەبا).

**corrupt** (kə-rupt′), ***adj.*** (١) پیس؛ بۆگەن ***( ~ air)***. (٢) خراپ؛ بەد: (ا) بەدڕەفتار؛ بەدڕەووشت؛ نزم. (ب) بەرتیل وەرگر ***( a ~ government official)***. (٣) گۆڕاو: شێواو؛ دەستکاری کراو (پەرتووك، نووسراو، زمان): ***( a ~ text of Shakespeare's plays)***

***v.t.*** (١) پیس کردن؛ بۆگەن کردن؛ خراپ کردن. (٢) بەرتیل پێدان؛ بەرتیل پێدانو لە ڕێی باش لادان. (٣) بەدڕەفتارکردن؛ بەدڕەووشت کردن: ***( They ~ed him.)*** (٤) گۆڕین (نووسراو، زمان)؛ دەستکاری کردن (پەرتووك، زمان، نووسراو)

***v.i.*** خراپ بوون؛ پیس بوون.

**corruptible** (kə-rup′tə-b'l), ***adj.*** (١) خراپ دەکرێت؛ خراپ دەبێت؛ پیس دەبێت. (٢) بەرتیلی دەدرێتێ؛ بەرتیل وەردەگرێت.

**-corruptibility** ***(n.)***.

**corruption** (kə-rup′shən), ***n.*** (١) خراپی؛ ناپاکی؛ بۆگەنی: ***( ~ in the government)*** (٢) بەدڕەفتاری؛ بەدڕەووشتی؛ بەدکاری. (٣) بەرتیل. (٤) (ا) پیسی؛ پیس بوون؛ ڕزین. (ب) شتێکی خراپکەر یا پیسکەر

**corruptionist** (kə-rup′shən-ist), ***n.*** کەسێك کە پەیڕەوی کاری خراپە دەکات بەتایبەتی بەرتیل وەرگرتن.

**corruptive** (kə-rup′tiv), ***adj.*** خراپکەر؛ پیسکەر؛ تێکدەر.

**corsage** (kôr-säzh′), ***n.*** (١) لە ناوقەد بەرەو ژووری کراسی ئافرەت. (٢) چەپکە گوڵێکە ئافرەت دەیکات بە قەد، سنگ، یا مەچەکیدا بۆ جوانی.

**corsair** (kôr′sâr), ***n.*** (١) چەتەی دەریا (بەتایبەتی لە ژوورووی ئەفەریقا کە هێرشیان دەبردە سەر کەشتی دیانەکان لە کۆندا). (٢) جەردەی دەریا؛ چەتەی دەریا. (٣) کەشتی چەتەی دەریا.

**corse** (kôrs), ***n.*** [Archaic & Poetic], لاشە؛ لاشەی مردوو.

**corselet** (kôrs′lit), ***n.*** (١) قەڵغان (لەکۆندا لەبەردەکرا). (٢) بەرگێکی تەسکی ژێرەوەیە بۆ ناوچەی لە ناوقەدەوە بۆ بەرمەمك ژن لەبەری دەکات بۆ هێنانەوەیەکی ناوقەدو سك.

**corset** (kôr′sit), ***n.*** (١) بەرگێکی تەسکی ژێرەوەیە بۆ ناوچەی لە ناوقەدەوە بۆ بەرمەمكو پەراسووی پلاستیکی تێدایەو هەندێك جار بە قەیتان قایم دەکرێت ئافرەت لەبەری دەکات بۆ هێنانەوەیەکی ناوقەدو وورگ (٢) [Archaic]، لە ناوقەد بەرەو ژووری کراسی ئافرەت.

***v.t.*** ئەم جۆرە بەرگە لەبەرکردن (ژمارە یەك ببینە).

**cortege** (kôr-tāzh′, kôr-tezh′), ***n.*** (١) دەستوپێوەند. (٢) دەستەی مردوو ڕاییکەران؛ دەستەی مردوو نێژەران.

**cortex** (kôr′teks), ***n.*** (١) توێکی دەرەوەی ئەندامێکی ناوەوەی لەشی مرۆڤ بەتایبەتی هی مێشك یا گورچیلە (توێکاری). (٢) توێکڵ (ڕووەکناسی)

**cortical** (kôr′ti-k'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە توێکی دەرەوەی ئەندامێکی ناوەوەی لەشی مرۆڤ. (٢) توێکڵی؛ توێکی. (٣) تایبەتی بە توێکی دەرەوەی مێشك.

**corticate** (kôr′ti-kit, kôr′ti-kāt′), ***adj.*** توێکدار؛ توێکلاوی.

**corticose** (kôr′ti-kōs′), ***adj.*** = **corticate.**

**cortisone** (kôr′tə-sōn′, kôr′tə-zōn′), ***n.*** کۆرتیزۆن: دەرمانێکە بۆ گەلێك ئەخۆشی بەکاردێت وەك باداری؛ هۆرمۆنی چارەسەرکردن

**coruscate** (kôr′əs-kāt′, kor′əs-kāt′), ***v.i.*** درەوشانەوە؛ تریفەدان؛ شەوقدانەوە؛ بریسکەدانەوە.

**coruscation** (kôr′əs-kā′shən, kor′əs-kā′shən), ***n.*** (١) - درەوشانەوە؛ تریفەهاتن؛ بریسکەدانەوە؛ شەوقدانەوە. (٢) بریسکە؛ کڵپە. (٣) بریسکەیەکی زیرەکی؛ نواندنێکی لەپڕی زیرەکی (وەك بریسکە).

**corvée** (kôr-vā′), ***n.*** بێگار.

**corves** (kôrvz), ***n.*** *plural of* **corf.**

**corvette, corvet** (kôr-vet′), ***n.*** (١) پاپۆڕێکی جەنگی کۆن. (٢) پاپۆڕێکی جەنگی بچووك کە دژی ژێردەریایی بەکاردەهێنرێت.

**corvine** (kôr′vīn, kôr′vin), ***adj.*** وەك قەلەڕەش؛ قەلەڕەشانە.

**corydalis** (kə-rid′ə-lis), ***n.*** ڕووەکێکە گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێت.

**corymb** (kôr′imb, kor′im), ***n.*** هێشووە گوڵێکە لاسکی گوڵەکانی دەرەوەی هێشووەکە درێژترە لەوانەی ناوەوە بە جۆرێکی وەها کە ڕوپی هێشووەکە تەخت دەردەچێت.

-**corymbose** ***(adj.)***.

**coryphaeus** (kôr′ə-fē′əs, kor′ə-fē′əs), ***n.*** (١) سەرتیپی-

کۆرەسی شانۆگەری یۆنانی کۆن. (٢) سەرتیپ (کۆرەس، ڕێکخراو).

**coryphee** (kôr´ə-fā′, kor´ə-fā′), *n.* سەماکەرێکی سەرەکی تیپی بالێ.

**coryza** (kə-rī′zə), *n.* هەلامەتێکی قورس؛ هەلامەت.

**cosignatory** (kō-sig′nə-tôr´i, kō-sig′nə-tō´ri), *adj.* مۆرکەر یا ئیمزاکەری پەیمانێك لەگەڵ چەند لایەکی تردا.

*n.* لایەك کە پەیمانێك مۆر دەکات لەگەڵ چەند لایەکی تردا (وڵات، ڕێکخراو).

**cosigner** (kō′sīn´ēr), *n.* دەستەبەر؛ لەنەستۆگر

**cosmetic** (koz-met′ik), *adj.* تایبەتی بە ئارایشت؛ جوانکەر.

*n.* ئارایشت؛ دەرمانی ئارایشت کردن؛ سووراوو سپیاو.

-cosmetically *(adv.).*

**cosmetician** (koz´mə-tish′ən), *n.* ئارایشتکەر؛ دەموچاوهەڵگر.

**cosmetology** (koz´mə-tol′ə-ji), *n.* هونەری ئارایشتکردن؛ هونەری جوانکردن

-cosmetologist *(n.).*

**cosmic** (koz′mik), *adj. Also* **cosmical,** (١) گەردوونی؛ تایبەتی بە گەردوون (٢) زۆر گەورە؛ زۆر فراوان؛ بێ سنوور. (٣) [Rare]، ڕێكوپێك.

-cosmically *(adv.).*

**cosmic dust,** تەپوتۆزی گەردوونی

**cosmic rays,** *Also* **ultra gamma rays,** تیشکی گەردوونی کە زۆر کورتو تیژە

**cosmism** (koz′miz'm), *n.* فەلسەفەو بیردۆزی بارگۆڕینی گەردوون.

**cosmo- , cosm-** (koz′mō, koz′mə), پێشگرێکە بەمانای: گەردوون؛ جیهان.

**cosmogony** (koz-mog′ə-ni), *n.* (١) بنچینەو پەیدابوونی گەردوون. (٢) تیۆری بنچینەو پەیدابوونی گەردوون.

-cosmogonic *(adj.).*

**cosmographer** (koz-mog′rə-fēr), *n.* گەردوونناس

**cosmographic** (koz´mə-graf′ik), *adj.* تایبەتی بە زانستی گەردوون

**cosmographical** (koz´mə-graf′i-k'l), *adj.* = cosmographic.

**cosmography** (koz-mog′rə-fi), *n.* گەردووننناسی (ا) باسێکی گشتی گەردوون یا جیهان (ب) زانستی پێکهاتنی گەردوون یا جیهانو بەشە پەیوەندیدارەکانی (زەمینناسیو جوگرافیاو ئەستێرەناسی) کە بەشێکن لەم زانستە.

**cosmology** (koz-mol′ə-ji), *n.* گەردووننناسی؛ زانستی گەردوون.

-cosmologic *(adj.)*; cosmological *(adj.)*; cosmologically *(adv.)*; cosmologist *(n.).*

**cosmonaut** (koz′mə-nôt´), *n.* کەشتیوانی ئاسمانی؛ ئاسمانگەڕ.

**cosmopolitan** (koz´mə-pol′ə-t'n), *adj.* (١) تایبەتی بە هەموو جیهان. (٢) جیهان پەرست؛ ڕەگەزپەرستو وڵات پەرست نییە.

(٣) دانیشتووەکانی لە هەموو لایەکی جیهانەوە هاتووە: *( a ~ city)* .

(٤) لە هەموو لایەکی جیهاندا دەڕوێت یا هەیە (ڕووەك، گیاندار).

*n.* هاوولاتی جیهانی: کەسێکە کە جیاوازی ناکات لەنێوان وڵاتو ڕەگەزەکەی خۆیو وڵاتو ڕەگەزەکانی تری جیهاندا وە بە یەك چاو سەیریان دەکاتو لە هەرچ شوێنێکدا بژی بەختەوەرە.

**cosmopolite** (koz-mop′ə-līt´), *n.* (١) هاوولاتی جیهانی (ڕوشەی پێشوو ببینە (٢) ڕووەك یا گیاندارێك کە لە هەموو لایەکی جیهاندا هەبێت، بڕوێت یا بژی.

**cosmorama** (koz´mə-ram′ə, koz´mə-rä′mə), *n.* پیشانگای دیمەنی هەموو لایەکی جیهان.

**cosmos** (koz′məs, koz′mos), *n.* (١) گەردوون.

(٢) هاوئاواز؛ هاودەنگی؛ گونجان.

(٣) ڕووەکێکە گەڵاکەی وەك پەڕە گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێت.

**Cossack** (kos′ak, kos′ək), *n.* قەوقازی؛ کەسێکی قەوقازی؛ پۆلەیەکی گەلی قەوقاز لە بەشی خوارووی یەکێتی سۆڤیەتی جاران کە بە ئەسپ سواری ناسراوە.

*adj.* تایبەتی بە گەلی قەوقاز؛ قەوقازی.

**cosset** (kos′it), *n.* (١) بەرخی ناومال.

(٢) گیاندارێکی ماڵی کە بۆ خۆشی ڕادەگیرێت نەك بۆ سوود (سەگ، پشیلە، کەروێشك، باڵندە... هتد).

**cost** (kôst), *v.i.* (١) تێچوون؛ بایی ئەوەندە بوون:

*( This book ~s nine dollars.; A car ~s a lot of money.)*

(٢) پێویست بوون؛ تێچوون:

*( Making a dictionary ~s a lot of time and care.)*

(٣) بوون بەهۆی لەدەست چوون؛ ئەوەندە تێچوون:

*( Carelessness may ~ you your life.)*

*v.t.* هەڵسەنگاندنی نرخی بەرهەم هێنانی شتێك.

*n.* (١) نرخ؛ بەها:

*( The ~ of living is much higher now than it used to be.)*

(٢) *(pl.)*، (ا) ئەو پارەیەی کە دەچێتە هێنانی داوایەك بۆ بەر دادگا وە ئەو لایەی داواکە دەدۆڕێنێت دەبێت بیدات. (ب) کرێی پارێزەر.

(٣) ئەو نرخەی کە لەپێناوی دەست کەوتنی شتێکدا دەدرێت:

*( The letter was won at great ~ of life.)*

at all costs, بە هەر نرخێك بێت؛ هەرچەندی تێ بچێت.

at any cost, بە هەر نرخێك بێت؛ هەرچەندی تێ بچێت.

**costa** (kos′tə), *n.* (١) پەراسوو؛ دەمار (توێکاری).

(٢) شتێك کە لە پەراسوو بکات وەك دەماری ناوەڕاستی گەڵایەك.

**co-star** (kō′stär´), *n.* هاوئەکتەر (فیلمی سینەمایی).

*v.t. & v.i.* نوواندن وەك هاوئەکتەر لە فیلمێکی سینەمایدا؛ هاوئەکتەری کردن لە فیلمێکدا.

**costard** (kos′tērd, kôs′tērd), *n.* (١) جۆرە سێوێکی ئینگلیزییە. (٢) [Archaic & Humorous]، سەر؛ کەللە.

**coster** (kos′tēr, kôs′tēr), *n.* = **costermonger.**

**costermonger** (kos´tēr-muŋ′gēr, kôs´tēr-muŋ′gēr), *n.* میوەو سەوزە فرۆشێکی سەر سووچی شەقامێك یا دەستگێڕ لە عەرەبانەیەکدا.

**costive** (kos′tiv, kôs′tiv), *adj.* (١) گرفت کردوو؛ قەبز.

(٢) دەبێت بەهۆی گرفت کردن؛ گرفتپێکەر. (٣) سست؛ خاو.

(٤) پیسکە؛ ڕەزیل؛ پارەپیس.

**costly** (kôst′li), *adj.* (١) گرانبەها؛ گران.

(٢) بەنرخ؛ نرخی تەواو نابێت؛ نایاب.

(٣) زۆر دەکەوێت لەسەر ئەو کەسەی دەیکات؛ خۆبەختکردنی لەدوایە؛ زۆری تێ دەچێت: *( a ~ war; ~ efforts)* .

-costliness *(n.).*

**costmary** (kost′mâr´i, kôst′mâr´i), *n.* سیس عومەر: ڕووەکێکی گەڵا بۆن خۆشە.

**cost of living,** بەهای ژیان: تێکڕای خەرجی کەسێك یا خێزانێك بۆ خواردنو خانوو جلوبەرگو هاتوچۆی پێویستی تری ژیان.

**cost-plus** (kôst′plus′), *n.* نرخی بەرهەم هێنانو هەندێك قازانج (کە وەك بنچینەیەك بەکاردێت لە پەیمانی زۆربەی حکومەتەکاندا بۆ پشتگیری کردنی جەنگ).

**costrel** (kos′trəl), *n.* شووشەیەکی قوڵفەدارە بۆ شلە تێکردنو هەڵواسین بە قەد یا شاندا.

**costume** (kos′tōōm, kos′tūm), *n.* (١) جلوبەرگ؛ بەرگ؛ پۆشاك.

(٢) جلوبەرگی ڕەگەز، ناوچە، یا بۆنەیەکی تایبەتی:

*( I will wear my Kurdish ~ tomorrow.)*

(٣) جلوبەرگی مەبەستێکی تایبەتی: *( a riding ~ )* .

*v.t.* جلوبەرگی تایبەتی لەبەرکردن لە بۆنەیەکی تایبەتیدا.

a costume party, ئاهەنگێك کە خەڵك خۆیانی بۆ دەگۆڕنو جلوبەرگی

سەیر لەبەردەکەن کە جیاوازە لە جلی پۆژانەیان

**a costume piece (or play),** شانۆگەرییەك کە ئەکتەرەکان جلوبەرگی مێژوویی تێدا لەبەردەکەن، واتە ئەو جلوبەرگەی کە باربووە لەو کاتەدا کە شانۆگەرییەکە باسی دەکات.

**costumer** (kos-tōōm′ẽr, kos-tūm′ẽr), *n.* بەرگدروو فرۆش یا بەکری دەری جلوبەرگی جیاوازو سەیر.

**cosy** (kō′zi), *adj.* = cozy.

**cot** (kot), *n.* چەرپایە یا جێگەیەکی تەسکی نوستن کە لە قوماشێکی ئەستوور دروستکراوەو لەسەر چوارچێوەیەکی قاچ کورتەو دەنووشتێنرێتەوە؛ جێگەی نوستنی منداڵ کە تەسك و بچووكەو دەنووشتێنرێتەوەو هەڵدەگیرێت.

**cot** (kot), *n.* (١) تەویلە یا کوختەیەکی بچووکی مەڕ. (٢) [Poetic]. کوختە؛ خانووی بچووك. (٣) کیفێکە بۆ پەنجەیەکی بریندار دەکرێت بۆ پاراستنی.

**cote** (kōt), *n.* (١) (ا) کولانە مریشك. (ب) هێلانەی کۆتر یا باڵندەی تر. (ج) تەویلە یا کوختەی مەڕ. (٢) [Dial.]، کوختە؛ خانووی بچووك.

**cotemporaneous** (kō-tem′pə-rā′ni-əs), *adj.* = contemporaneous.

**cotemporary** (kō-tem′pə-rer′i), *adj. & n.* = contemporary.

**cotenant** (kō-ten′ənt), *n.* هاوکرێچی؛ هاوکرێگرتە.

**coterie** (kō′tẽr-i, kō′tə-rē′), *n.* دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ؛ تاقمێك کە دەم دەم کودەبنەوە بەمەبەستی چالاکی کۆمەڵایەتی، ویژەیی، یا هونەری:
*(a literary ~)*

**coterminous** (kō-tũr′mə-nəs), *adj.* = cothurnus.

**cothurn** (kō′thẽrn, kō-thũrn′), *n.* = cothurnus.

**cothurnus** (kō-thũr′nəs), *n.* (١) جزمەیەکە ئەکتەری تراجیدی یۆنان و رۆمان لەپێیان دەکرد. (٢) تراجیدیا؛ مەرگەسات. (٣) شێوەی تراجیدیا لە شانۆگەریدا.

**cotillion** (kō-til′yən, kə-til′yən), *n.* (١) سەمایەکی خێرای فەرەنسییە. (٢) مۆسیقای ئەم سەمایە. (٣) ئاهەنگێکی سەمایە کە بۆ یەکەم جار کچی تێدا پێشکەشی کۆمەڵ دەکرێت.

**cotquean** (kot′kwēn′), *n.* [Archaic], (١) ژنێکی دەم پیسی بێ حەیا. (٢) پیاوێکی سەرژنانی؛ پیاوێك کە ئیشی ژنانەی ناوماڵ بکات.

**cottage** (kot′ij), *n.* (١) کوختە. (٢) خانوویەکی بچووکی هاوینەهەواری.

**cottage cheese,** جۆرە پەنیرێکی سپی دەنك خڕی داندار دانداره.

**cottager** (kot′ij-ẽr), *n.* (١) نیشتەجێی خانووی بچووك؛ کوختەنشین. (٢) [British]. رەنجبەر؛ وەرزێر؛ مسکین.

**cotter, cottar** (kot′ẽr), *n.* (١) کوختەنشین. (٢) [Scot.]، مسکین؛ بەکرێگری کێڵگەیەك.

**cotter** (kot′ẽr), *n.* جۆرە بورغویەکە کە دوو پارچەی مەکینەیەکی پێکەوە پێ دەبەسترێت؛ پوازێکی ئاسنە کە دەکرێت بە کونێکدا بۆ پێکەوەبەستنی دوو پارچەی مەکینەیەك.

**cottier** (kot′i-ẽr), *n.* مسکین؛ بەکرێگری کێڵگە کە خاوەن زەوی.

**cotton** (kot′′n), *n.* (١) لۆکە. (٢) پەموو؛ رووەکی پەموو. (٣) بەرهەمی پەموو. (٤) جلوبەرگی لۆکە؛ دەزووی لۆکە.

*adj.* لۆکەیی؛ تایبەتی بە لۆکە؛ لە لۆکە دروستکراو؛ لۆکە؛ کەتان.

**cotton (up) to,** [Colloq.], (١) لەگەڵ گونجان؛ لەگەڵ یەکتری رێکەوتن. (٢) برادەری کردن؛ بوون بە برادەر؛ لەگەڵدا هەڵسان و دانیشتن. (٣) بەدڵداچوون؛ حەزلێکردن.

**cotton batting,** لۆکەی پزیشکەوانی.

**Cotton Belt,** هەرێمی باشووری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە لۆکەی زۆرەو بە لۆکە ناسراوە.

**cotton cake,** پەموانە؛ ناوکە پەموو (دەدرێت بە مەڕومالات).

**cotton flannel,** کەتان.

**cotton gin,** جیکەنە؛ شیکەنە؛ مەکینەی جیاکردنەوەی پەموو لە پەموانە.

**cottonmouth** (kot′′n-mouth′), *n.* مارێکی ژەهراوی گەورەیە.

**cotton picker,** (١) پەموورِن؛ پەمووچن؛ مرۆڤ یا مەکینەیەك کە پەموو دەچنێت یا دەرنێت. (٢) پەمووپاککەر (مەکینە)؛ پەموو پوختەکەر.

**cottonseed** (kot′′n-sēd′), *n.* پەموانە؛ تۆوی پەموو.

**cotton stainer,** جانەوەرێکە قۆزاخەی پەموو پەڵەدار دەکات.

**cottontail** (kot′′n-tāl′), *n.* کەروێشکێکی ئەمەریکییە کلکی کورت و تووکن و بن سپییە.

**cottonweed** (kot′′n-wēd′), *n.* گیایەکە تووکی لۆکەیی بە گەڵاکانیەوەیەتی.

**cottonwood** (kot′′n-wood′), *n.* (١) درەختێکی تۆو تووکاوییە. (٢) داری ئەم جۆرە درەختە.

**cotton wool,** لۆکەی خاو (بۆ برینپێچی، لێفە، بەری جلوبەرگ).

**cottony** (kot′′n-i), *adj.* (١) لۆکەیی؛ تایبەتی بە لۆکە. (٢) فشەڵ؛ نەرم؛ وەك لۆکە.

**cotyledon** (kot′′l-ē′d′n), *n.* یەکەم گەڵای تۆوێکی پشکوتوو؛ چەکەرە.

**couch** (kouch), *n.* (١) قەنەفە. (٢) جێی حەوانەوە. (٣) [Poetic]، جێی نوستن. (٤) [Obs.]، لانە. (٥) (ا) چینێك جۆ کە هەڵدەخرێت بۆئەوەی بتەقێتەوە (بیرە دروستکردن). (ب) شوێنی ئەم جۆ هەڵخستنە.

*v.t.* (١) لەسەر قەنەفە دانیشتن یا پاڵکەوتن. (٢) داهێنانەوەی تیر، نێزە، یا رم بۆ نیشانەگرتن و هاویشتنی. (٣) دەربرین (بیر، هەڵوێست)؛ دەربرین بەجۆرێکی شاراوە:
*(His refusal was ~ed in very polite words.)*
(٤) نەقشکردن؛ نەخشاندن؛ نەخش و نیگارکردن. (٥) [Obs.]، شاردنەوە. (٦) جۆ هەڵخستن بۆ تەقینەوەی (بیرە دروستکردن).

*v.i.* (١) راکشان یا پاڵکەوتن لەسەر جێ یا قەنەفە. (٢) خۆ مات کردن (بۆ پەلاماردان)؛ خۆ مت کردن؛ خۆ مەڵاسدان. (٣) کۆمەڵ بوون (گەڵا)؛ گردبوونەوە.

**couchant** (kouch′ənt), *adj.* (١) راکشاو یا پاڵکەوتوو (گیاندار). (٢) خۆ مت کردوو؛ خۆ مەڵاسداو (گیانداری وەك شێر، پڵنگ، وورچ... هتد)

**couch grass,** گیایەکە زوو تەرز فرێ دەدات و پەرەدەسێنێت.

**cougar** (kōō′gẽr), *n.* گیاندارێکی درندەی خێرایە لە پڵنگ بچووکترە؛ پشیلەکێوی گەورە؛ شێری چیا.

**cough** (kôf), *v.i. & v.t.* کۆکین؛ فرێدان بە کۆکین (بەڵغەم)؛ هێنانەوە.

*n.* کۆکە.

**cough up,** (١) هێنانەوە بە کۆکین (بەڵغەم)؛ فرێدان بە کۆکین. (٢) [Slang]، دانە دەست (پارە).

**cough drop,** حەپلەی کۆکە؛ دەرمانی کۆکە لە شێوەی نوقڵدا.

**could** (kood), (١) رابوردووی کرداری " can "
(٢) کرداری یارمەتیدەرە: (ا) لەوانەبوون دەردەبڕێت: *(It ~ be so.)*.
(ب) رێگەدان دەردەبڕێت: *(C~ I go?)*.

**couldn't** (kood′′nt), = could not.

**couldst** (koodst), [Archaic or Poetic], شێوەی رابوردووی کرداری " can " بۆ کۆنێگر (رێزمان): *(Thou ~)*، واتە تۆ دەتتوانی.

**coulee** (kōō′li), *n.* (١) چەمێکی قووڵ کە لە باراناو یا بەفراو پێکدێت و هاوینان ووشکە. (٢) (ا) جۆگەیەکی ئاگرپڕێنی. (ب) تەبەقێکی رەقی ئاگرپڕێنی.

**coulisse** (kōō-lēs′), *n.* (١) پارچە دارێکە کە کەندۆك یا دیراوێکی تێدابێت و دەرگا یا شتێکی وەها پیایدا هاتوچۆ بکات یا بەئاسانی بسوورێت. (٢) (ا) دیمەنی لاکانی شانۆ. (ب) ماوەی نێوان ئەم دیمەنانە.

**coulomb** (kōō-lom′), *n.* یەکەی پێوانی تەزووی کارەبا؛ هەندی ئەو کارەبایەی کە تەزوویەکی یەك ئەمپێری دەیدات لە چرکەیەکدا.

**coulter** (kōl′tẽr), *n.* = colter.

**coumarin** (kōō′mə-rin), *n.* ئاوێتەیەکی بلووریيە لە چێشت لێنان و دروستکردنی بۆنی خۆشدا بەکاردەهێنرێت.

**council** (koun′s'l), *n.* (١) ئەنجوومەن؛ کۆڕ: (ا) ئەنجوومەنی شارەوانی. (ب) ئەنجوومەنی یاسایی یا ڕاوێژکاری. (ج) ئەنجوومەنی کرێکارانی شارێك. (د) ئەنجوومەنی کڵێسە. (٢) لێکۆڵینەوەو لێدووانی ئەنجوومەنێك.

**councilman** (koun′s'l-mən), *n.* ئەندامی ئەنجوومەنی شارەوانی.

**council of ministers,** ئەنجوومەنی وەزیران.

**council of war,** (١) ئەنجوومەنی جەنگ. (٢) ئەنجوومەنی دانانی نەخشەی کار.

**councilor, councillor** (koun′s'l-ēr), *n.* ئەندامی ئەنجوومەن.

**counsel** (koun′s'l), *n.* (١) ڕاوێژ؛ ڕاوێژکردن؛ ڕاوێژکاری. (٢) ئامۆژگاری؛ تەمێکردن؛ بەسەرداهاتن: ***( to give good ~ )*** . (٣) نەخشە؛ بڕیار. (٤) پارێزەر؛ دەستەیەك پارێزەر. (٥) [Archaic]، زیرەکی؛ دانایی؛ زرنگی. (٦) [Obs.]، ڕاز؛ نەخشە یا بیرێکی نهێنی.

*v.t.* (١) ئامۆژگاری کردن؛ تەمێکردن. (٢) پەسەندکردن؛ هاندانی پەسەندکردنی نەخشە یا ڕێبازێك.

*v.i.* ڕاوێژکردن؛ ڕاوێژپێکردن؛ ئامۆژگاری کردن یا وەرگرتن.

**keep one's own counsel,** نەخشەو پلان و بیروباوەڕی خۆ بە کەس نەووتن؛ ڕازی خۆ لای کەس نەدرکاندن.

**take counsel,** ڕاوێژکردن؛ لێکۆڵینەوە

**counselor, consellor** (koun′s'l-ēr), *n.* (١) ڕاوێژکار؛ ئامۆژگاریکەر. (٢) ڕاوێژکاری دادی باڵیۆزخانەیەك. (٣) پارێزەر (دادگا). (٤) ڕابەر یا ئامۆژگاریکەری دەستەیەك منداڵ لە گەشتێکی چەند ڕۆژی دەرەوەی شاردا.

**count** (kount), *v.t.* (١) ژماردن

***( He ~ed five.; to ~ from one to twenty)***

(٢) کۆکردنەوە؛ سەرجەم کردن؛ ژماردن:

***( The shopkeeper was ~ing his money.)***

(٣) دانان؛ وا دانان؛ ژماردن؛ وا ژماردن:

***( I no longer ~ him among my friends.;***
***He ~s himself fortunate.)***

(٤) ڕەچاوکردن؛ لێکدانەوە

*v.i.* (١) ژماردن. (٢) ڕەچاوکردن. (٣) بە گرنگ دانان؛ گرنگ بوون. ***( His opinions don't ~ .)*** .

*n.* (١) ژماردن. (٢) سەرجەم. (٣) هەریەك لەو تاوانانەی کە ئاراستەی گومانبارێك دەکرێت (دادگا).

**count for,** بەنرخ بوون؛ بایەخ بوون

**count in,** دانان بە بەشێك لە

**count off,** جیاکردنەوەو کردن بە بەش بەشی یەکسانەوە.

**count on (or upon),** پشت پێ بەستن؛ پێدا ڕاپەڕموون

**count out,** (١) گوێ پێ نەدان؛ بایەخ پێ نەدان؛ دانەنان بە بەشێك لە. (٢) [British]، دوایی پێ هێنانی لێکۆڵینەوەی باسێك لە پەرلەمانی ئینگلتەرەدا لەبەر ئامادەنەبوونی ڕێژەیەکی تایبەتی لە ئەندامەکان. (٣) [Colloq.]، دۆڕاندنی هەڵبژاردنێك بە هەڵە ژماردنی دەنگەکان. (٤) بڕیاردانی ناوبژیوان بە دۆڕاندنی بۆکسبازێك لەبەر کەوتنی و هەڵنەسانەوەی لە ماوەی ژماردنی یەك تا دەدا.

**count** (kount), *n.* کۆنت بەگزادەیەکی ئەورووپایی؛ نازناوێکی ئەورووپایيیە وەك " ئاغا "

**countdown, count-down** (kount′doun′), *n.* ژماردنی- بەرەوژێری هەتا سفر لەکاتی تەقاندنی مووشەك یا بۆمبای ئەتۆمی یا هەڵدانی کەشتی ئاسمانی بۆ بۆشایی ئاسمان؛ ژماردنی بەرەو سفری وەها لە هەر بوارێکدا بێت.

**countenance** (koun′tə-nəns), *n.* (١) ڕووخسار؛ ڕوو؛ شێوە. (٢) نیشانەی پەسەندکردن لە ڕووخساردا. (٣) پەسەندکردن؛ پاڵپشتی کردن. (٤) هێمنی؛ خۆگرتن؛ لەسەرخۆیی: ***( lose ~ )*** .

*v.t.* پەسەندکردن؛ پاڵپشتی کردن: ***( to ~ someone's behavior)*** .

**in countenance,** هێمن؛ لەسەرخۆ.

**keep one's countenance,** خۆگرتن؛ تێك نەچوون؛ نەدانە پێکەنین.

**put out of countenance,** سەر لێ شێواندن؛ تەریق کردنەوە؛ تەریق بوونەوە.

**counter** (koun′tēr), *n.* (١) ژمێرەر (مرۆڤ، ئامێر)؛ ژمێریار. (٢) پارچەیەك باغە یا پلاستیکی بچووك کە ژمارەی پێ ڕادەگیرێت لە قوماردا لەبری پارە. (٣) پارەیەکی کانزایی قەڵب. (٤) بەرمێز؛ مێزی درێژ (بانق، فرۆشگا، فەرمانگە، بار، چێشتخانە)؛ پێشخوان.

**over the counter,** لە فەرمانگەدا دەکڕێت و دەفرۆشرێت نەك لە بارەگای پارەبازیدا.

**under the counter,** بەدزییەوە (کڕین و فرۆشتن لە بازاڕی ڕەشدا)؛ بە پەنهانی.

**counter** (koun′tēr), *adv.* بەپێچەوانەی؛ بەدژی:

***( to act ~ to a person's wishes)***

*adj.* دژ؛ پێچەوانە.

*n.* (١) پێچەوانە؛ دژ. (٢) سنگی ئەسپ. (٣) پارچەیەك قایشی قایم بەدەوری دیوی ناوەوەی پاژنەی پێڵاودا. (٤) بەشی سەرئاوی دواوەی کەشتی. (٥) چاڵایی نێوان دوو چوکڵە. (٦) بۆکسێك کە دەهاوێژرێت لەکاتی خۆلادان لە بۆکسی بەرامبەر (بۆکسبازی)

*v.t. & v.i.* (١) بەپێچەوانە جووڵانەوە؛ دژوەستان؛ بەرهەڵستی کردن. (٢) بۆکسدان لە بەرامبەر لەکاتی خۆلادان لەبەردەمی بۆکسەکەیدا (بۆکسبازی).

**counter** (koun′tēr), *n. & v.t.* [Archaic], تووش هاتن؛ تووش بوون؛ هاتنەڕێ.

**counter-** (koun′tēr), پێشگرێکە بەمانای: (١) بەپێچەوانەی:

***( counterclockwise)***

(٢) دژ؛ دژ کردار: ***( counterattack)*** . (٣) هاوتا؛ بەرامبەر: ***( counterpart)*** .

**counteract** (koun′tēr-akt′), *v.t.* بەرهەڵستی کردن؛ پووچکردنەوە یا کەمکردنەوەی کاریگەری شتێك:

***( The doctor gave him some medicine to ~ the effects of the poison.)***

**counteraction** (koun′tēr-ak′shən), *n.* کرداری دژ یا هاوتا. -counteractive *(adj.).*

**counterattack** (koun′tēr-ə-tak′), *n.* هێرشی دژ؛ هێرشێك کە بەربەرەکانی هێرشی دوژمن بکات.

*v.t. & v.i.* هێرشی پێچەوانە کردنەسەر؛ هێرش کردنەسەر بۆ بەربەرەکانی کردنی هێرشی دوژمن.

**counterattraction** (koun′tēr-ə-trak′shən), *n.* سەرنج- ڕاکێشانی هاوچاو یا دژ؛ دڵفڕێنی هاوچاو.

**counterbalance** (koun′tēr-bal′əns), *n.* (١) کێشی هاوهێز؛ کێشی هاوتا. (٢) کردار یا کاریگەری هاوهێز؛ هێز یا کردارێکی هاوتا

*v.t.* هاوتایی کردن؛ هاوهێزی کردن.

**counterblow** (koun′tēr-blō′), *n.* لێدانێکی پێچەوانە؛ لێدانی بەرامبەر.

**counterchange** (koun′tēr-chānj′), *n.* (١) تاوانبارکردنی پێچەوانە. (٢) هێرشی پێچەوانە.

*v.t.* (١) تاوانبارکردنی پێچەوانە. (٢) هێرش بردنەسەری پێچەوانە.

**countercheck** (koun′tēr-chek′), *n.* (١) کۆسپ؛ بەربەست. (٢) دووبارە پیاچوونەوە (بۆ دڵنیایی لە هەڵە)؛ ڕەچاوکردن.

*v.t.* (١) کۆسپ دانان لە ڕێگەدا؛ وەستاندن.

(٢) دووباره پیاچوونەوە (بۆ دڵنیایی لە هەڵە)؛ رەچاوکردن.

**counterclaim** (koun′tēr-klām′), *n.* داوای پێچەوانە (دژی داواچی لە دادگادا).

*v.t. & v.i.* داوای پێچەوانە پێشکەش کردن لە دادگادا

**counterclaimant** (koun′tēr-klām′ənt), *n.* داواکاری پێچەوانە (دژی داواچی لە دادگادا).

**counterclockwise** (koun′tēr-klok′wīz′), *adj. & adv.* بە- پێچەوانەی جووڵەی میلی کاتژمێرەوە.

**countercurrent** (koun′tēr-kūr′ənt), *n.* تەووژم یا تەزووی پێچەوانە

**counterdemonstration** (koun′tēr-dem′ən-strā′shən), *n.* خۆپیشاندانی پێچەوانە دژی خۆپیشاندانێکی تر؛ خۆپیشاندانی بەرامبەر یا دژ.

**counterespionage** (koun′tēr-es′pi-ə-nij), *n.* سووسەکردنی دژ یا پێچەوانە؛ دژە سووسە.

**counterfeit** (koun′tēr-fit), *adj.* (١) ساختە *( ~ money)*.
(٢) درۆ؛ درۆزنانە؛ رووالەت: *( ~ sorrow)*.

*n.* (١) نموونەیەکی قەڵب یا ساختە (دراو). (٢) [Archaic]، ساختەچی.
(٣) [Archaic]، وێنە (پەیکەر، دیمەن).

*v.t. & v.i.* (١) دراوی قەڵب یا ساختە دەرهێنان.
(٢) وا دەرخستن؛ وا پیشاندان بە درۆوە. (٣) لێکچوون؛ لەیەکچوواندن.

**counterfeiter** (koun′tēr-fit′ēr), *n.* دراوی ساختە درووستکەر؛ دراوی قەڵب لێدەر

**counterfoil** (koun′tēr-foil′), *n.* قنگە چەك یا رەسید کە لەلای خاوەنەکەی دەمێنێتەوە.

**counterjumper** (koun′tēr-jump′ēr), *n.* [Colloq.], فرۆشیار (دووکان).

**counterman** (koun′tēr-mən), *n.* بەردەستی چێشتخانەیەك کە لەسەر پێشخوان کاردەکات.

**countermand** (koun′tēr-mand′), *v.t.* (١) سڕینەوەی فەرمانێك
(٢) کشاندنەوەی فەرمانێك.

*n.* فەرمانێك کە فەرمانی پێشووتری دەسڕێتەوە.

**countermeasure** (koun′tēr-mezh′ēr), *n.* کرداری پێچەوانە یا دژ.

**countermine** (koun′tēr-mīn′), *n.* (١) تونێلێك کە تەقەمەنی تێ دەکرێت بۆ وێرانکردنی تونێلی دوژمن (٢) تەقەمەنی ژێرئاو بۆ لەناوبردنی ژێردەریایی دوژمن (٣) پیلانی دژ؛ پیلانی تێکدەر.

*v.i. & v.t.* (١) بەربەرەکانی کردنی کردارەکانی دوژمن بە کرداری هاوتا.
(٢) شکاندن یا تێکدانی پیلانی دوژمن بە پیلانێکی تر.

**countermove** (koun′tēr-mōōv′), *n.* جووڵەی دژ؛ جووڵانەوەی پێچەوانە یا تۆڵەیی.

*v.i. & v.t.* جووڵانەوەی دژ، پێچەوانە، یا تۆڵەسەندن.

**counteroffensive** (koun′tēr-ə-fen′siv), *n.* هێرشی پێچەوانە؛ هێرشی بەربەرەکانی؛ هێرشی دژ.

**counterpane** (koun′tēr-pān′), *n.* پۆپەشمێ یا جاجمێك کە دەدرێت بەسەر جێگەی نووستندا.

**counterpart** (koun′tēr-pärt′), *n.* (١) هاوتا؛ بەرامبەر؛ هاوسەنگ؛ پارسەنگ *( Your right hand is the ~ of your left hand.)*.
(٢) تەواوکەر *( Woman is the ~ of man.)*
(٣) [Obs.]. وێنە؛ دەق.

**counterplot** (koun′tēr-plot′), *n.* پیلانێك کە بۆ شکاندنی پیلانی تر دادەنرێت؛ پیلانی پیلان تێکدەر.

*v.t. & v.i.* دانانی پیلانێك بۆ شکاندن یا ژێرخستنی پیلانێکی تر.

**counterpoint** (koun′tēr-point′), *n.* (١) (ا) ئاوازێك کە دەخرێتە پاڵ ئاوازێکی ترو لەگەڵی دەگونجێنرێت. (ب) خستنە پاڵ یەکترو گونجاندنی ئاواز. (٢) بیروباوەڕ یا وەڵامێکی پێچەوانە یا دژ.

**counterpoise** (koun′tēr-poiz′), *n.* (١) هاوسەنگ؛ پارسەنگ؛ شتێکی هاوتا. (٢) هێزێکی هاوتا؛ کاریگەرییەکی هاوهێز.
(٣) هاوسەنگی؛ هاوتایی.

*v.t.* هاوتاکردن؛ هاوسەنگ کردن؛ بوون بە پارسەنگ.

**counterpoison** (koun′tēr-poi′z′n), *n.* (١) [Obs.] دەرمانی دژە ژەهر. (٢) ژەهری دژە ژەهر؛ دژە ژەهر.

**counterproductive** (koun′tēr-prə-duk′tiv), *adj.* دەبێتە هۆی ئەنجامی خراپ؛ زیانبەخش.

**counterproposal** (koun′tēr-prə-pō′z′l), *adj.* پێشنیازی پێچەوانە؛ پێشنیازێك کە بۆ بەرهەڵستی کردنی پێشنیازێکی تر دەکرێت.

**counterreformation** (koun′tēr-ref′ēr-mā′shən), *n.* بزووتنەوەیەکی چاکسازییە کە بەرپەرچی بزووتنەوەیەکی تری چاکسازی پێشتر دەداتەوەو بەرهەڵستی دەکات و هەڵی دەگێڕێتەوە.

**Counter Reformation,** بزووتنەوەی چاکسازی لە کڵێسەی کاسۆلیکیدا لەئەنجامی بزووتنەوەی چاکسازی پرۆتستانتی، واتە دابەشبوونی کڵێسە بە دوو بەشەوەو جیابوونەوەی پرۆتستانتەکان لەسەدەی شانزەهەمدا.

**counterrevolution** (koun′tēr-rev′ə-lōō′shən), *n.* شۆڕشی دژ؛ بزووتنەوەی دژ بە شۆڕش.

**counterrevolutionary** (koun′tēr-rev′ə-lōō′shən-er′i),
*n.* دوژمنی شۆڕش؛ کەسێکی دژ بە شۆڕش.
*adj.* دژ بە شۆڕش؛ تایبەتی بە بزووتنەوەو هەڵوێستی دژ بە شۆڕش.

**counterscarp** (koun′tēr-skärp′), *n.* دیواری دەرەوەی خەندەقی پارێزەر (خەندەقی پڕ لە ئاوی دەوری قەڵایەك کە لە هێرشی دوژمن دەیپارێزێت).

**countershaft** (koun′tēr-shaft′), *n.* ستوونی ناوەڕاست کە ووزە یا بزووتن لە ستوونی سەرەکییەوە دەگەیەنێت بەو پارچەیەی مەکینە کە پێویستە بسووڕێتەوە تاکو مەکینەکە کار بکات.

**countersign** (koun′tēr-sīn′), *n.* (١) مۆری دەستەبەری؛ ئیمزای دەستەبەری؛ مۆری پەسەندکردن. (٢) پەرلە؛ نیشانەی نهێنی

*v.t.* مۆرکردنی بڕوانامەیەك بۆ دەستەبەری.

**countersignature** (koun′tēr-sig′nə-chēr), *n.* مۆر یا ئیمزای دەستەبەری.

**countersink** (koun′tēr-siŋk′), *v.t.* (١) گەورەکردنی دەمی کونێك بۆ پێکردنی بورغویەك بە کونەکە. (٢) پیاکردنی بورغویەك بەم کونەدا.

*n.* (١) ئامێری گەورەکردنی کونێکی وەها. (٢) کونێکی گەورەکراو بەم شێوەیە.

**counterstatement** (koun′tēr-stāt′mənt), *n.* ووتەی بەرپەرچ دەرەوە؛ ووتاری دژ.

**counterstroke** (koun′tēr-strōk′), *n.* لێدانێکی پێچەوانە.

**countervail** (koun′tēr-vāl′), *v.t.* (١) بەکارهێنانی هێزێکی هاوتا دژی هێزی بەرامبەر. (٢) بژاردن؛ بۆ بژاردن.
(٣) بەرهەڵستی کردن؛ بەرپەرچدانەوە؛ هاوسەنگ کردن.

**counterweight** (koun′tēr-wāt′), *n.* هاوتا؛ هاوسەنگ؛ پارسەنگ.

*v.t.* هاوتاکردن؛ هاوسەنگ کردن؛ پارسەنگ کردن.

**counterwork** (koun′tēr-wūrk′), *n.* (١) دژکار.
(٢) سەنگەری دژ بە سەنگەری دوژمن یا بەرامبەر.

**countess** (koun′tis), *n.* کۆنتێس: (ا) ژن یا بێوەژنی " کۆنت " : نازناوێکی ئەورووپاییە وەك " خانم " یا " خان ".
(ب) ژنێکی بەگزادە کە لە پلەی " کۆنت " دایە.

**countinghouse** (koun′tiŋ-hous′), *n.* فەرمانگەی ژمێریاری و نامەکاری و فایل هەڵگرتنی کارگە یا دەزگایەکی بازرگانی؛ فەرمانگەی شتی تۆمارکراو.

**countless** (kount′lis), *adj.* بێ شومار؛ گەلێك؛ زۆر؛ ژمارەیەکی لە ژماردن نەهاتوو.

**countrified** (kun′tri-fīd′), *adj. Also* **countryfied,** لادێیی؛ کراو بە لادێیی؛ وەك لادێیی لێهاتوو.

**country** (kun′tri), *n.* (١) وولات؛ کیشوەر.
(٢) هاوولاتیان؛ دانیشتووانی وولاتێك:
*( Does the ~ really want war?)*
(٣) نیشتمان؛ خاکی باووباپیران: *( to return to one's ~ )* .
(٤) ناوچە؛ زەویوزار: *( wooded ~ )* .
(٥) لادێ؛ دەرودێهات؛ دەرەوەی شار.
(٦) بەشێك لە بەشەکانی زانست: *( This subject is strange ~ to me.)* .
(٧) دەستەی سوێندخۆران لە دادگادا.
*adj.* (١) لادێ؛ لادێیی؛ تایبەتی بە لادێ یا لادێیی.
(٢) [Dial]، هاوولاتی؛ خۆمالّی؛ هی وولاتی خۆ.

**go to the country,** هەلّگرتنی ئەنجومەنی گشتی پەرلەمانی ئینگلتەرەو هەلّبژاردنی تازە کردن

**country club,** یانەی سەرمایەدارانو خۆش گوزەرانان (بۆ وەرزشو چالاکی تری ئەندامان).

**country cousin,** لادێیی؛ کەسێکی لادێیی کە بە شار ڕانەهاتووەو ژیانی ناوشاری پێ خۆش نییە سەری لێ دەشێوێت.

**country-dance** (kun′tri-dans′, kun′tri-däns′), *n.* سەمای لادێ: جۆرە سەمایەکە بەزۆری خەلّکی لادێ دەیکەن وە بریتییە لە ڕیزبوونی ژنو پیاو بەرامبەر بە یەك یا لە ئەلّقەیەکداو سەماکردنیان پێکەوە.

**countryfied** (kun′tri-fīd′), *adj.* = **countrified.**

**countryfolk** (kun′tri-fōk′), *n.* لادێیی؛ خەلّکی لادێ

**country gentleman,** بەگزادەی لادێ؛ پیاوێکی ساماندارى خاوەن زەویوزارو خانووبەرەیەکی زۆر لە لادێدا.

**country house,** خانووبەرەی بەگزادەیەکی لادێ؛ خانوویەکی گەورەو خۆشی جەپەکی لادێ

**countryman** (kun′tri-mən), *n.* (١) لادێیی.
(٢) هاوولاتی؛ هاونیشتمانی.

**countryseat** (kun′tri-sēt′), *n.* خانوویەکی گەورەی دەرەبەگێك لە لادێ.

**countryside** (kun′tri-sīd′), *n.* (١) دەشتودەر؛ دەشت؛ دێهات؛ دەرەوەی شار؛ لادێ: *( A trip to the ~ is always refreshing.)* .
(٢) خەلّکی لادێ؛ دانیشتووانی لادێ.

**countrywoman** (kun′tri-woom′ən), *n.* (١) ژنە لادێیی؛ ئافرەتی لادێ. (٢) هاوولاتی (ئافرەت)؛ هاونیشتمانی.

**county** (koun′ti), *n.* (١) ناوچە یا هەرێمێکی بەڕێوەبەرایەتی (هاوتای " قەزا " یە). (٢) دانیشتووانی ئەم ناوچەیە.
(٣) [Obs.]. هەرێمێك کە " کۆنت " ێك بەڕێوەی دەبات.

**county seat,** بارەگای ئەم ناوچە بەڕێوەبەرایەتییە کە پێی دەوترێت " کاونتی "

**coup** (kōō), *n.* (١) لێدانێك؛ پیاکێشانێك؛ پیامالّینێك؛ پیادانێك.
(٢) کردارێکی لەپڕو ناکاوو سەرکەوتوو: *( He pulled off a great ~ .)* .
(٣) لێدانی ڕژێمێك ڕووخاندنی؛ لێدانی میریو هەلّگێڕانەوەی.

**coup de grâce,** (١) لێدانی کوشندە: دوا لێدان یا گوللەیەك کە کەسێکی بریندار یا نەخۆشی پێ دەکوژرێتو دەحەوێنرێتەوە (ئەم جۆرە کوشتنە لە ڕقەوە نایەت بەلّکو لە دلّ پێ سووتاندنو بەزەیییەوەیە).
(٢) کرداری دوایی پێ هێنەر؛ کردارێك کە شتێك بخات بەلایەکداو بیبڕێنێتەوە.

**coup de main,** هێرشێکی لەپڕو لەناکاو (جەنگ).

**coup d'état,** کۆدیتا لێدانو ڕووخاندنی ڕژێمێك؛ لێدانو هەلّگەڕاندنەوە دژی میری.

**coup de théâtre,** (١) گۆڕینێکی لەپڕو سەرنج ڕاکێش لە شانۆگەریدا.
(٢) کردار یا ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێشو هێنەرەجۆش.

**coup d'oeil,** سەیرکردنێکی لەپڕو کورت.

**coupe** (kōōp), *n.* ئوتومبیلێکی دوو دەرگا کە جێی دوو تا پێنج کەسی تێدا دەبێتەوە

**coupé** (kōō-pā′), *n.* (١) عەرەبانەیەکی داخراو کە جێی دوو کەسی تێدا دەبێتەوە. (٢) دوا فارگۆنی شەمەندەفەری ئەورووپایی. (٣) **coup** .

**couple** (kup′′l), *n.* (١) جووتێك شت یا کەسی هاوجۆر؛ دوو کەس یا شتی هاوبابەت: *( a ~ of girls, rabbits, books, apples, etc.)*
(٢) جووت؛ جووتە: (ا) ژنو مێرد: *( a married ~ )* .
(ب) جووتە دەزگیران: *( a courting ~ )*
(ج) جووتە سەماکەر: *( Ten ~s took to the floor.)* .
(٣) [Colloq.]، چەند (شت، کەس، بیروباوەڕ، شوێن... هتد)؛ لە دوو زیاتر، بەلاّم زۆر نا: *( I've a ~ of things to do.)* .
(٤) پەیوەندی؛ پەیوەست بوون.
(٥) دوو هێزی هاوتا کە لە ڕێکی یەکتر بەلاّم بە پێچەوانەی یەکترەوە دەبزوێن
*v.t.* (١) پێکەوەبەستن؛ لێکدان. (٢) کردن بە ژنو مێرد؛ جووت کردن
(٣) لێکدانی دوو تەووژمی کارەبا.
*v.i.* (١) بوون بە دووان؛ جووت گرتن. (٢) جووت بوون؛ گان کردن.

**coupler** (kup′lẽr), *n.* (١) بەیەك گەیەنەر؛ کەسێك کە جووت دەگرێت لەگەلّ کەسێکی تردا. (٢) ئامێری بەیەك گەیاندن؛ ئامێری بەیەك گەیاندنی دوو فارگۆنی شەمەندەفەر.

**couplet** (kup′lit), *n.* دووخشتەکی.

**coupling** (kup′liŋ), *n.* (١) بەیەککەیشتن؛ لێکدان؛ جووت بوون.
(٢) ئامێرێکی بەیەك گەیەنەر. (٣) ئامێری بەیەك گەیاندنی دوو فارگۆنی شەمەندەفەر. (٤) ئامێری بەیەك گەیاندنی دوو تەووژمی کارەبا.

**coupon** (kōō′pon, kū′pon), *n.* کۆبۆن.

**courage** (kũr′ij), *n.* (١) ئازایەتی؛ قارەمانی؛ نەبەردی؛ بەجەرگی.
(٢) [Obs.]، مێشك؛ دلّ؛ هۆش؛ هۆشوگیان.

**have the courage of one's convictions,** نەترسان لە کردنی ئەو شتەی بە ڕاستی دەزانێتو بڕوات پێی هەیە.

**courageous** (kə-rā′jəs), *adj.* ئازا؛ قارەمان؛ نەبەرد؛ بەجەرگ.

**courant** (kōō-ränt′), *n.* = **courante.**

**courante** (kōō-ränt′), *n.* (١) سەمایەکی خێرای فەرەنسییە
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.

**courier** (koor′i-ẽr, kũr′i-ẽr), *n.* (١) پەیامبەر (بەتایبەتی هەلّگری پەیامی گرنگو پەلەی میری). (٢) هاوەلّی گەشتیار: کەسێك کە بەکرێ دەگیرێت بۆئەوەی لەگەلّ گەشتیاراندا بێتو هۆی گواستنەوەو ئوتێلیان بۆ بگرێتو سەرەوکاری جانتاکانیان بکات.

**course** (kôrs, kōrs), *n.* (١) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن؛ پێشکەوتن.
(٢) ئاراستەی ڕۆیشتن. (٣) ماوە: *( in the ~ of a week)* .
(٤) ئاوەڕۆ (جۆگە، ڕووبار).
(٥) ناوچە یا ڕێڕەوی ملەملێیەك: *( a race ~ ; a golf ~ )* .
(٦) ڕێبازی سرووشتی شتێك؛ ڕێڕەو: *( The law must take its ~ .)*
(٧) زنجیرە؛ لیستە. (٨) ڕێباز: *( the ~ of true love)* .
(٩) بەشی ژەمێك خواردن: *( The main ~ was fish.)* .
(١٠) چینە خشت، بەرد، یا دار لە دیوار یا سەربانێکدا.
(١١) کۆرس (زانکۆ، قوتابخانە)؛ وەرزی خوێندن:
*( The psychology ~ was interesting.)*
*v.t.* (١) نیشتنەسەر (ڕاوکردن)؛ شوێن کەوتن؛ ڕافڕاندن.
(٢) تێ بەردان (سەگ لە ڕاوکردندا).
(٣) خێرا پێداڕۆیشتن: *( The blood ~d through his veins.)*
*v.i.* (١) ملەملێ کردن. (٢) نیشتنەسەر؛ شوێن کەوتن؛ ڕافڕاندن.
(٣) ڕاوکردن بە سەگ.

**a matter of course,** شتێکی سرووشتی؛ شتێکی ئاسایی.
**in due course,** لە کاتی خۆیدا.
**in the course of,** لە ماوەی؛ لە کاتی.
**of course,** بێ گومان.
**to run its course,** بە ڕێگەی سرووشتی خۆدا ڕۆیشتن هەتا دوایی هاتن.
**to stay the course,** خۆڕاگرتنو بەردەوام بوون هەتا کۆتایی؛ لانەدان.
**to take its course,** ڕێگەی سرووشتی خۆ گرتن.

**courser** (kôr′sēr, kōr′sēr), *n.* [Poetic], ئەسپێکی خێرا.
**courser** (kôr′sēr, kōr′sēr), *n.* باڵندەیەکی خێرای کەنار دەریایە.
**courser** (kôr′sēr, kōr′sēr), *n.* (١) سەگی ڕاو. (٢) ڕاوچی.
**coursing** (kôr′siŋ, kōr′siŋ), *n.* (١) نیشتنەسەر (ڕاو)؛ ڕافڕاندن؛ شوێن کەوتن. (٢) ڕاوکردن بە سەگ.
**court** (kôrt, kōrt), *n.* (١) حەوشە. (٢) حەوشەیەکی سەر داپۆشراو. (٣) شەقامێکی کورتی دەرنەچوو. (٤) گۆڕەپان؛ وەرزشگا (تەنس، باسکە، باڵە)؛ بەشێکی گۆڕەپانی وەرزشی. (٥) خانوویەکی گەورە کە داڵانێکی سەرنەگیراو یا حەوشەیەکی گەورەی لەبەردەمدا بێت. (٦) کۆشکی شاهانە؛ کۆشکی پاشا.
(٧) خێزان و ڕاوێژکارو دەست‌وپێوەندی پاشا.
(٨) پاشا و وەزیرو ڕاوێژکارەکانی وەك ئەنجوومەنی فەرمانڕەوایی.
(٩) کۆڕی پاشا. (١٠) مەرایی. (١١) دڵداری؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان.
(١٢) (ا) دادگا؛ دادگەر؛ دادگەران. (ب) خانەی دادگا. (ج) کۆڕی داگەران.
*v.t.* (١) مەرایی کردن؛ کلکەلەقێ بۆ کردن.
(٢) دڵداری کردن؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان
(٣) (ا) هەوڵی دەستگیربوون دان: *( You must ~ an opportunity.)* .
(ب) بەشوێنداگەڕان: *( You are ~ing trouble.)* .
*v.i.* دڵداری کردن؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان.
**contempt of court,** بە سووك سەیری دادگا یا دادگەر کردن؛ گوێ نەدان بە بڕیاری دادگا یا دادگەر.
**pay court to,** (١) دڵداری لەگەڵ کردن؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان.
(٢) مەرایی کردن؛ کلکەلەقێ بۆ کردن.
**settle a case out of court,** بڕینەوەی ناکۆکی یا داوایەك لە دەرەوەی دادگا
**take a case (someone) to court,** دان بە دادگا (ناکۆکی، مرۆڤ).
**courteous** (kūr′ti-əs), *adj.* زمان شیرین؛ ناسك؛ ڕووخۆش و بەتەنگ هەستی خەڵکەوە هاتوو.
**courtesan, courtezan** (kôr′tə-z'n, kōr′tə-z'n), *n.* قەحبە؛ ئافرەتێکی سووك
**courtesy** (kūr′tə-si), *n.* (١) زمان شیرینی؛ ناسکی؛ ڕووخۆشی و بەتەنگ هەستی خەڵکەوە هاتن. (٢) چاکە؛ کردەوە یا ووتەیەکی ناسك.
(٣) پەسەندی و سەرپەرشتی و ڕێگەدان:
*( a radio program presented by* [through] *the ~ of- a business company.)*
(٤) کڕنووش بردن (کچ).
**courtesy title,** نازناوی ڕێزلێگرتن (کە دەدرێت لە نەوەی " دۆق " و بەگزادە لەڕووی ڕێزەوە نەك لەبەرئەوەی مافیان پێوەیەتی).
**courthouse** (kôrt′hous′, kōrt′hous′), *n.* (١) خانەی داد؛ دادگا (٢) بارەگای فەرمانڕەوایی ناوچە؛ سەرا.
**courtier** (kôr′ti-ēr, kôr′tyēr, kōr′ti-ēr), *n.* (١) پاش میر؛ دەست‌وپێوەندێکی پاشا. (٢) مەراییکەر.
**courtly** (kôrt′li, kōrt′li), *adj.* (١) پاشایانە؛ جوان و بەرز (ڕەفتار، ئەریت)؛ ڕێك‌وپێك: *( ~ manners)* .
(٢) مەراییکەرانە؛ خۆسووککەرانە.
*adv.* بە جوانی و ڕێك‌وپێکی (ڕەفتار، ئەریت).
-courtliness *(n.)*.
**courtly love,** دڵداری کردن لەگەڵ ئافرەتێکی مێرددارو پەرستنی لە دوورەوە بەبێ هەوڵدانی جووت بوون لەگەڵیدا (ئەریتێکی سەدانی ناوەڕاستە)؛ خۆشویستن لە دوورەوە.
**court-martial** (kôrt′mär′shəl, kōrt′mär′shəl), *n.* (١) - دادگای سوپایی. (٢) (*pl.*)، دادپرسینێك لە دادگای سوپاییدا.
*v.t.* دران بە دادگای سوپایی.
**Court of Appeals,** دادگای پیاچوونەوە.
**Court of St. James,** دادگای شاهانەی ئینگلیزی.
**court plaster,** برین هەڵپێچ.

**courtroom** (kôrt′rōōm′, kōrt′room′), *n.* ژووری دادگا.
**courtship** (kôrt′ship, kōrt′ship), *n.* دڵداری و ماوەی ئەو دڵدارییە" دڵداری.
**cousin** (kuz′'n), *n.* (١) ئامۆزا (کوڕ یا کچ)؛ پورزا؛ خاڵۆزا.
(٢) خزم (نێر یا مێ). (٣) ئەندامی کۆمەڵ یا گەلێکی هاوڕەگەز.
(٤) ئەو ناوەی پاشا بانگی پاشایەکی تر یا بەگزادەیەکی پێ دەکات.
(٥) [Slang]، هاوچاوێك کە بەبێ ئەوەی پێی بزانێت سوودت پێ دەگەیەنێت.
**cousin-german** (kuz′'n-jūr′mən), *n.* ئامۆزا (نێر یا مێ)؛ پورزا؛ خاڵۆزا.
**cousinry** (kuz′'n-ri), *n.* ئامۆزاو پورزاو خاڵۆزا یا خزمان بەتێکڕایی.
-cousinship *(n.)*.
**couteau** (kōō′tō′), *n.* (١) چەقۆیەکی گەورەیە کە وەك چەك هەڵدەگیرێت. (٢) خەنجەرێکی دوو دەم.
**couth** (kōōth), *adj.* (١) ڕەفتارجوان؛ بەڕەووشت (بۆ پێکەنین بەکاردێت).
(٢) [Obs.]، زانراو؛ ناسراو.
**couture** (kōō′tür), *n.* (١) نەخشەکێشان و دوورین و فرۆشتنی جل و- بەرگی ژنانە (بەتایبەتی هی مۆدەو جوان). (٢) کەسێك کە نەخشەی جل و- بەرگی مۆدەی ژنانە دەکێشێت و دەیدروونێت و دەیفرۆشێت.
**couturier** (koo′tü′ryā′), *n.* (١) نەخشەکێش و بەرگدروو فرۆشیاری جل‌وبەرگی مۆدەی ژنانە. (٢) دەزگای نەخشەکێشان و دوورین و فرۆشتنی بەرگی مۆدەی ژنانە.
**couvade** (kōō-väd′), *n.* ئەریتی هەندێك خێڵی دوور لە شارستانییە کە بریتییە لە هاوسۆزی مێرد لەگەڵ ژنەکەیدا لەکاتی منداڵبووندا بە کەوتنی لەسەر جێگە هەروەك ئەویش منداڵی ببێت.
**covalence** (kō-vā′ləns), *n.* *Also* covalency, هاوهێزی (کیمیا).
**cove** (kōv), *n.* (١) ئەشکەوت؛ کەنار یا قوژبنی کەندەلانێك.
(٢) کەنداوێکی بچووك.
(٣) ڕاڕەوی نێوان دوو گرد یا بێشە؛ دەربەندێکی تەسك.
(٤) تیرەیەك زەوی کە لە بێشەیەك دەدات.
(٥) (ا) تیلماسکێکی ڕازێنەرەوەی قوپاو لە بنمیچێکدا. (ب) کەوانەیەکی قوپاو.
*v.t. & v.i.* قوپاندن؛ قوپان.
**cove** (kōv), *n.* [British Slang], زەلام؛ کابرا؛ کوڕ.
**covenant** (kuv′ə-nənt), *n.* (١) پەیمان؛ ڕێکەوتن.
(٢) پەیمانی خوا لەگەڵ ئادەمیزاددا (بەگوێرەی ئینجیل).
*v.i. & v.t.* پەیمان بەستن؛ پەیماندان.
**covenantee** (kuv′ə-nənt-ē′), *n.* پەیماندەر؛ پەیمانبەست.
**covenanter** (kuv′ə-nən-tēr), *n.* پەیماندەر؛ پەیمانبەست.
**covenantor** (kuv′ə-nən-tēr), *n.* پەیماندەر؛ پەیمانبەست.
**cover** (kuv′ēr), *v.t.* (١) (ا) داپۆشین (بۆ پاراستن یا شاردنەوە)؛ سەر داپۆشین؛ سەرنانەوە. (ب) ڕووکەش کردن؛ تێهەڵسوون.
(٢) داپۆشین: *( Snow ~ed the highway.)* .
(٣) سواربوون؛ گاین؛ جووت بوون.
(٤) لەسەر نیشتن (مریشك لەسەر هێلکە).
(٥) پۆشین؛ بەرگ کردنەبەر. (٦) شاردنەوە.
(٧) پاراستن:
*( Warships ~ed the landing of the invading army.)*
(٨) گرتنەوە: *( The law ~s such cases.)* .
(٩) پاراستنی دارایی؛ بیمەکردن: *( My auto insurance ~s theft.)* .
(١٠) بڕین (ڕێگە): *( He ~ed the distance in ten minutes.)* .
(١١) باسکردن؛ لێکۆڵینەوە؛ گرتنەوە:
*( The book ~s the subject thoroughly.)*
(١٢) نیشانەلێگرتن.
(١٣) یاری کردن بە کاردێکی بەنرختر لەوەی پێشوو (یاری کاغەز یا قومار).
(١٤) دەنگوباس کۆکردنەوەو وێنەگرتن بۆ ڕۆژنامە، رادیۆ، یا تەلەفزیۆن:
*( The reporter ~ed the accident.)*

(١٥) قایل بوون بە مەرجی گرەوێك.
*v.i.* (١) ڕووکەش کردن؛ بەسەردا بڵاوکردنەوە
(٢) [Colloq.]، کارکردن لەبری؛ جێگری کردن.
(٣) شاردنەوەی شتێك بۆ پاراستنی هاوکارێك‌و ڕزگارکردنی لە سزا یا سەرزەنشت کردنی: *( to ~ up for a colleague)*.
*n.* (١) (ا) بەرگ (بەرتووك). (ب) سەرقاپ؛ قەپاغ؛ سەر (ج) پێخەف؛ سەرەخەر.
(٢) سەنگەر (٣) لانە یا شوێنی خۆشاردنەوەی گیانداری کێوی.
(٤) سەرمێزو قاپ‌و کەوچك‌و چنگاڵ بۆ یەك کەس.
(٥) مزی چوونە تیاترۆ یا یانەی سەما. (٦) ڕوواڵەت؛ خۆنوواندنی درۆ.
**break cover,** هاتنەدەرەوە لە شوێنی خۆشاردنەوە.
**cover up,** (١) گرتنەوە؛ داپۆشین. (٢) شاردنەوە (ڕاز).
**take cover,** خۆشاردنەوە یا خۆپاراستن لە گوللەی دوژمن.
**under cover,** (١) بەدزی‌یەوە. (٢) بە ڕوواڵەت؛ بەسەرزاری. (٣) شاراوە.
**under the same cover,** لە هەمان زەرفدا (نامەنووسین).
**coverage** (kuv′ēr-ij), *n.* (١) داپۆشین؛ مەودای داپۆشین.
(٢) ڕادەی لێکۆڵینەوەو باسکردن (ڕۆژنامە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن):
*( The news ~ of the war was extensive.)*
(٣) ڕادەی پاراستن لەلایەن کۆمپانیای بیمەوە (وەك خانوو سووتان، دزی، ڕووداوی ئۆتۆمبیل).
(٤) ڕادەی پاراستن بە دراو.
**coverall** (kuv′ēr-ôl′), *n.* بەرگێکی یەك پارچەی سەرتاپایە خاوەن پیشە لەبەری دەکات (بەتایبەتی فیتەرو کرێکاری کارگەو کشتیار)
**cover charge,** مزی چوونە تیاترۆ یا یانەی سەما
**cover crop,** دانەوێڵەیەك کە دەچێنرێت بۆ پاراستنی زەوی لە ڕامالین.
**covered** (kuv′ērd), *adj.* (١) داپۆشراو؛ شاراوە
(٢) قەپاغدار؛ سەرقاپدار. (٣) پارێزراو (بیمە) (٤) کڵاو لەسەر؛ کڵاودار.
**covered wagon,** واگۆنێکی سەر داپۆشراوی بە ئەسپ یا گا ڕاکێشراو.
**cover girl,** کچێکی حواز کە زوو زوو وێنەکەی لەسەر بەرگی گۆڤارەکان دەبینرێت؛ کچی سەر بەرگی گۆڤار
**covering** (kuv′ēr-iŋ), *n.* بەرگ؛ سەرەخەر؛ پێخەف؛ قاوغ؛ سەرقاپ
**covering letter,** نامەیەك کە لەگەڵ بڕوانامە یا بەڵگەیەکدا دەنێردرێت بۆ ڕوونکردنەوەی
**coverlet** (kuv′ēr-lit), *n.* (١) پۆپەشمین یا جاجمێك کە دەدرێت بەسەر جێگەی نووستندا (٢) شتێك کە شتێکی تری پێ دادەپۆشرێت.
**coverlid** (kuv′ēr-lid), *n.* = **coverlet.**
**covert** (kuv′ērt), *adj.* (١) نهێنی؛ شاراوە؛ پەنهانی:
*( a ~ threat; a ~ operation)*
(٢) داپۆشراو؛ پارێزراو.
(٣) مێردەکەی دەیپارێزێت؛ لەژێر دەستی مێردەکەیایەتی.
*n.* (١) کەنار؛ پەنا (٢) شوێنی خۆشاردنەوەی گیانداری کێوی وەك بێشە (ڕاو).
(٣) پەڕێکی نەرم‌و بچکۆلەیە لەبنی پەڕە گەورەکانی باڵندەدا (زیندەوەرزانی).
**covertly** (kuv′ērt-li), *adv.* بەنهێنی؛ بەدزی‌یەوە.
**coverture** (kuv′ēr-chēr), *n.* (١) پەنا؛ کەنار؛ شوێنی خۆشاردنەوە یا پاراستن (٢) شاردنەوە؛ بەرگ؛ سەر.
(٣) باری ژیانی ئافرەتی مێردار (کە لەژێر دەست یا پاراستنی مێردەکەیایەتی).
**covet** (kuv′it), *v.t. & v.i.* ویستن یا حەزلێکردن (بەتایبەتی شتێك کە هی کەسێکی تر بێت)؛ بێزووکردن بە شتی کەسێکی ترەوە.
**covetous** (kuv′i-təs), *adj.* بێزووکەر بە شتی کەسێکی ترەوە؛ چاوچنۆك؛ چاوبرسی.
**covey** (kuv′i), *n.* (١) پۆلە مەل (بەتایبەتی قەتێ یا کەو).
(٢) دەستە (مرۆڤ)؛ تاقم.
**covin** (kuv′in), *n.* (١) [Archaic]، ساختە؛ فێڵ‌وتەڵەکە.
(٢) [Obs.] پەیمانێکی نهێنی. (٣) پەیمانێکی دووکەسی بۆ لەخشتەبردن‌و ساختەلێکردنی کەسێك یا چەند کەسێکی تر.
**coving** (kōv′iŋ), *n.* تیلماسکێکی ڕازێنەرەوەی بنمیچ (خانووسازی).
**cow** (kou), *n.* (١) مانگا. (٢) مێینەی فیل‌و نەهەنگ‌و گامێش.
**cow** (kou), *v.t.* ترساندن؛ بەچەترسێن کردن.
**coward** (kou′ērd), *n.* ترسنۆك؛ کەسێکی بێ غیرەت‌و نامەردو پووشت.
*adj.* ترسنۆك؛ بێ غیرەت؛ نامەرد؛ کوونی.
**cowardice** (kou′ēr-dis), *n.* ترسنۆکی؛ بێ غیرەتی؛ نامەردی.
**cowardliness** (kou′ērd-li-nis), *n.* = **cowardice.**
**cowardly** (kou′ērd-li), *adj.* ترسنۆك؛ ترسنۆکانە؛ بێ غیرەت؛ نامەرد؛ نامەردانە: *( a ~ act)*.
*adv.* بە ترسنۆکانە؛ بە نامەردانە.
**cowbane** (kou′bān′), *n.* ڕووەکێکی ژەهراوی‌یە لە گێزەر دەچێت.
**cowbell** (kou′bel′), *n.* زەنگی مانگا (کە دەکرێتە ملی مانگا بۆئەوەی خاوەنەکەی بزانێت لە کوێدایە بە دەنگی زەنگەکەدا).
**cowberry** (kou′ber′i, kou′bēr-i), *n.* جۆرە تووترکێکە.
**cowbird** (kou′bũrd′), *n.* باڵندەیەکی ڕەشی بچووکە لەنزیك ڕەشە- وڵاخەوە دەژی‌و هێلکە لە هێلانەی باڵندەی تردا دەکات.
**cowboy** (kou′boi′), *n.* گاوان (بەتایبەتی بە سواری ئەسپەوە).
**cowcatcher** (kou′kach′ēr), *n.* چوارچێوەیەکی کانزایی‌یە بە پێشی شەمەندەفەرەوە بەستراوە بۆ پاکردنەوەی هێڵە ئاسنەکان.
**cower** (kou′ēr), *v.i.* خۆ گرموڵەکردن یا چوونەوەیەك (لە ترس یا لە سەرمادا)؛ خۆکشانەوە (لە ترس یا لە سەرمادا).
**cowfish** (kou′fish′), *n.* (١) جۆرە ماسی‌یەکی شاخدارە.
(٢) جۆرە نەهەنگێکی بچووك یا گیانداری ئاوی شیردارە.
**cowgirl** (kou′gũrl′), *n.* گاوانی کچ؛ کچە گاوان.
**cowhand** (kou′hand′), *n. Also* **cow hand,** گاوان.
**cowherd** (kou′hũrd′), *n.* گاوان.
**cowhide** (kou′hīd′), *n.* (١) پێستە مانگا. (٢) قایشی پێستە مانگا.
(٣) قامچی پێستە مانگا (بەتایبەتی هی هۆنراوە).
*v.t.* قامچی لێدان؛ فەلاقەکردن بە قامچی پێستە مانگا.
**cow killer,** جۆرە زەردەواڵەیەکە ئەگەر بە ڕەشەوڵاخەوە بدات دەیکوژێت.
**cowl** (koul), *n.* (١) کڵاوی ووشکەسۆفی. (٢) کەواو کڵاوی ووشکەسۆفی.
(٣) شتێك کە لە کڵاو بچێت: (ا) کڵاوەی سەر لوولە زۆپا یا کڵاوڕۆژنە (ب) بەشی پێشەوەی ئۆتۆمبیل. (ج) قاوغ یا کڵاوەی مەکینەی فڕۆکە
*v.t.* کڵاو کردنەسەر؛ کڵاوە خستنەسەر.
**cowl** (koul), *n.* [Archaic], دەفرێکی دوو قولفەیی‌یە ئاوی پێ دەگوێزرێتەوە.
**cowled** (kould), *adj.* (١) کڵاولەسەر. (٢) کڵاوئاسا؛ کڵاوەئاسا.
**cowlick** (kou′lik′), *n.* تۆپەڵێك قژی جیابووەوە کە بەتەختی بەسەر سەرەوە ناوەستێت وەك ئەوەی مانگا لستبێتی‌یەوە.
**cowling** (kou′liŋ), *n.* قاوغ یا کڵاوەی مەکینەی فڕۆکە.
**cowlstaff** (koul′staf′, koul′stäf′), *n.* دارێکە دەکرێت بە هەردوو قولفەی دەفری ئاو گواستنەوەداو بە دوو کەس هەڵدەگیرێت.
**cowman** (kou′mən), *n.* (١) خاوەنی کێڵگەی ڕەشەوڵاخ.
(٢) [British]، گاوان.
**co-worker** (kō-wũr′kēr), *n.* هاوکار؛ هاوفرمان؛ هاوەڵی کار.
**cowpea** (kou′pē′), *n.* لۆبیا.
**cow pony,** ئەسپی کورتەباڵای گاوان.
**cowpox** (kou′poks′), *n.* ئاوڵەی مانگا؛ ئاوڵەی ڕەشەوڵاخ.
**cowpuncher** (kou′pun′chēr), *n.* = **cowboy.**
**cowrie, cowry** (kou′ri), *n.* گوێچکەماسی‌یەکی بەنرخە (وەك پارە لە هەندێك وڵاتانی ئەفەریقا‌و خوارووی ئاسیادا بەکاردەهێنرێت).
**cow shark,** قرشێکی گەورەیە.
**cowshed** (kou′shed′), *n.* پەچەی سەرگیراوی ڕەشەوڵاخ؛ کەپر یا تەویلەی ڕەشەوڵاخ.
**cowslip** (kou′slip′), *n.* جۆرە گوڵێکی بۆن خۆشە.
**cox** (koks), *n., v.t. & v.i.* = **coxcomb.**

**coxa** (kok'sə), ***n.*** (١) سمت. سمتەجۆلە؛ ئێسقانی سمت.
(٢) ڕانی مێروو

**-coxal** *(adj.)*.

**coxalgia** (kok-sal'ji-ə), ***n.*** نەخۆشی یا ئازاری سمتەجۆلە یا ئێسقانی سمت

**coxalgy** (kok'sal'ji), ***n.*** = coxalgia.

**coxcomb** (koks'kōm'), ***n.*** (١) کڵاوی پۆپنەدار وەک پۆپنەی کەڵەشێر (٢) پۆپنەی کڵاوێکی وەها.
(٣) کەسێکی لەخۆبایی بەفیزی هیچوپووچ؛ کەسێکی زۆر تەرپۆش.
(٤) پۆپنەی کەڵەشێر.

**coxswain** (kok's'n, kok'swān'), ***n.*** کەشتی لێخوڕ

**coy** (koi), ***adj.*** (١) شەرمن؛ بەشەرم. (٢) نازکەر؛ بەناز؛ نازفرۆش.
***v.i.*** [Archaic], شەرم کردن.
***v.t.*** [Obs.], (١) هێمن کردنەوە؛ لاواندنەوە. (٢) دەست پێداهێنان.

**-coyly** *(adv.)*; coyness *(n.)*.

**coyote** (kī'ōt, kī-ō'ti, kī-ōt'), ***n.*** گورگێکی بچووکی ئەمەریکای باکوورە

**coyotillo** (kō'yə-tēl'yō, kī'ə-tēl'yō), ***n.*** ڕووەکێکی درکاوی ژەهراوییە

**coypu** (koi'pōō), ***n.*** گیاندارێکی ئاوی شیرداری کرۆژەندەیە لە کونی هەڵکەنە دەچێت

**coz** (kuz), ***n.*** [Colloq.]. = **cousin.**

**coze** (kōz), ***v.i.*** دەمەتەقێ‌کردن
***n.*** دەمەتەقێ

**cozen** (kuz''n), ***v.t. & v.i.*** ساختەکردن؛ گزی کردن؛ هەڵخەڵەتاندن.

**cozenage** (kuz''n-ij), ***n.*** ساختە؛ گزی؛ فێڵ‌وتەڵەکە.

**cozey** (kō'zi), ***adj.*** = cozy.

**cozy** (kō'zi), ***adj.***. (١) گەرم‌و خۆش‌و خنجیلانە (شوێن): ***( a ~ room)***
(٢) نزیک‌و گیانی بە گیانی (برادەرێتی).
***n.*** کڵاوەی تۆری جا (نەریتێکی ئینگلیزییە بۆ مانەوەی چاکە بە گەرم‌وگوڕی).
**cozy up to,** [Colloq.], خۆ لێ بردنە پێشەوە بۆ سوود وەرگرتن

**crab** (krab), ***n.*** (١) قرژاڵ؛ قرژانگ (٢) چنگنە
(٣) مەکینەی شت بەرزکردنەوە
(٤) [C-]. کۆنەستێرەی قرژاڵ؛ بورجی قرژاڵ (ئەستێرەوانی).
(٥) فڕینی لابەلایی فڕۆکەیەک.
***v.i.*** ڕاوکردنی قرژاڵ؛ قرژاڵ گرتن.
***v.t.*** فڕینی فڕۆکەیەک بە لابەلایی.
**catch a crab,** بەلاداخستنی بەلەمی سەوڵ (بەهۆی بە هەڵە سەوڵ لێدانەوە).

**crab** (krab), ***n.*** (١) جۆرە سێوێکی مزرە.
(٢) کەسێکی تەنگەجیکڵانەو تووڕەوتۆزو زۆر سکاڵاکەر.
***adj.*** تایبەتی بە جۆرە سێوێکی مزر.
***v.t. & v.i.*** [Colloq.], هەمیشە سکاڵاکردن؛ ڕەخنەگرتن.

**crab apple,** (١) جۆرە سێوێکی مزرە (کێوی یا ماڵی).
(٢) داری ئەم جۆرە سێوە.

**crabbed** (krab'id), ***adj.*** (١) تووڕەوتۆزو تەنگەجیکڵانە.
(٢) ئاڵۆزاو؛ تێگەیشتنی گرانە لەبەر ئاڵۆسکاوی.
(٣) خوێندنەوەی گرانە لەبەر شێواوی بەسەریەکدا: ***( ~ handwriting)*** .

**crabber** (krab'ēr), ***n.*** (١) قرژانگ گر. (٢) بەلەمی ڕاوە قرژانگ.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی هەمیشە سکاڵاکەر یا ڕەخنەگر.

**crabby** (krab'i), ***adj.*** تەنگەجیکڵانەو تووڕەوتۆز.

**crab grass,** جۆرە گیایەکە خێرا تەرز فرێ دەداتو چنگ دەداتە یەک و دەکرێت بە چیمەن.

**crab louse,** چنگنەیەکە دەداتە ئاوگەڵ.

**crabs** (krabs), ***n.pl.*** [Colloq.], چنگنەتێدانی ئاوگەڵ.

**crabstick** (krab'stik'), ***n.*** (١) داردەست یا گۆچانی دارسێو.
(٢) کەسێکی تەنگەجیکڵانەو تووڕەوتۆزو زۆر بەسکاڵا.

**crab tree,** دارسێوێکە کە سێوی مزر دەگرێت.

**crack** (krak), ***v.i.*** (١) شەقە لێ هەڵسان (لە کاتی قرنجان یا شکاندا)؛ قرچەهاتن. (٢) شەقە لێ هەڵسان (قامچی، تفەنگ):
***( His rifle ~ed and the deer fell dead.)***
(٣) درزبردن؛ تەقین (پیالە، پەرداخ)؛ شکان؛ قڵیش بردن؛ قرنجان
***( to ~ an egg)***
(٤) گڕبوونی دەنگ (کە منداڵ دەبێتە هەرزە).
(٥) [Dial.]، فشەکردن. (٦) [Dial.]، دەمەتەقێ کردن.
(٧) [Slang]، ڕووخان (مێشک یا لەش):
***( Will he ~ under the strain?)***
(٨) نوکتەبازی کردن؛ قسەی نەستەق کردن.
***v.t.*** (١) شەقە لێ هەڵساندن: ***( C~ the whip)*** .
(٢) درز پێ بردن؛ تەقاندن؛ قرنجان؛ شکان؛ قڵیش پێ بردن.
(٣) دەنگ گڕکردن. (٤) شێیبوونەوە لەئەنجامی کوڵاندندا (نەوتی خاو).
(٥) [Colloq.]، زللە لێدان؛ شەقە لێ هەڵساندن بە لێدان؛ تەقاندن (پەنجە).
(٦) [Colloq.]، چارەسەرکردن؛ دۆزینەوە:
***( The police have finally ~ed that murder case.)***
(٧) [Slang]، بڕین (دزی)؛ شکاندن‌و کردنەوە:
***( The thief ~ed the safe.)***
(٨) [Slang]، نوکتەبازی کردن؛ قسەی نەستەق کردن:
***( He enjoys ~ing jokes.)***
(٩) شکاندن (ناوبانگ).
(١٠) (ا) کردنەوەو خواردنەوە: ***( to ~ a bottle of wine)*** .
(ب) کردنەوەو خوێندنەوە: ***( to ~ a book)*** .
***n.*** (١) شەقە: ***( the ~ of a whip)*** . (٢) درز؛ قڵیش؛ تلیش.
(٣) قرنجان؛ درزبردن؛ قڵیشان؛ شکان. (٤) دەنگ گڕبوون.
(٥) [Dial.]، دەمەتەقێ. (٦) [Archaic]، فشە؛ فشەبازی.
(٧) [Colloq.]، شەپازلە؛ شەقەی زللە یا شەپازلە؛ شەقەی هەر لێدانێک.
(٨) چرکە (کات). (٩) دز؛ ماڵ بڕین. (١٠) [Slang]، هەوڵ؛ تەقەلا.
(١١) [Slang]، نوکتە؛ قسەی نەستەق؛ قسەی زل.
***adj.*** [Colloq.], نایاب؛ کارامە؛ لێهاتوو.
**crack a book,** [Slang], کردنەوەو خوێندنەوەی پەرتووکێک.
**crack a smile,** [Slang], زەردەخەنە هاتن.
**crack down (on),** [Colloq.], بە توندوتیژی لەگەڵ جووڵانەوە (میری لەگەڵ ئەوانەی شتی قەدەغە دەکەن).
**crack up,** [Colloq.], (١) کەوتنەخوارەوە (فڕۆکە).
(٢) ڕووخان (مێشک یا لەش)؛ بەرگەنەگرتن.
**crack wise,** [Slang], قسەی زل کردن.

**crackajack** (krak'ə-jak'), ***adj. & n.*** [Slang], = **cracker-jack.**

**crackbrained** (krak'brānd'), ***adj.*** شێت؛ سەیر (مرۆڤ).

**cracked** (krakt), ***adj.*** (١) قڵیشاو؛ قرنجاو؛ درزبردوو؛ شکاو.
(٢) گڕ (دەنگ). (٣) [Colloq.]، شێت.

**cracker** (krak'ēr), ***n.*** (١) شکێنەر (ئامێر، مرۆڤ)؛ گوێزشکێن.
(٢) دەمەرقاچان. (٣) بسکویت. (٤) کەسێکی سپی هەژار لە لادێی بەشی خوارووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (لەڕووی بێزلێهاتنەوە بەکاردێت).

**crackerbarrel** (krak'ēr-bar'əl), ***adj.*** تایبەتی بە دەمەتەقێی هەمەچەشنەی دووکانی لادێ.

**crackerjack** (krak'ēr-jak'), ***adj.*** [Slang], نایاب؛ کارامە؛ لێهاتوو.
***n.*** (١) [Slang] ، شتێکی نایاب. (٢) کەسێکی لێهاتوو یا کارامە.

**crackle** (krak''l), ***v.i.*** قرچەقرچ هاتن یا تەقین (داری ناو ئاگر).
***v.t.*** شکاندن‌و قرچەقرچ لێ هەڵساندن.

*n.* (١) قرچەقرچ؛ دەنگی تەقینەوە (داری ناو ئاگر، دەمەرقاچان).
(٢) درزی باریکی سەر گۆزەودیزە (وەك نەقش).
(٣) گلێنەیەك کە ئەم درزە باریکەی لەسەر کرابێت.
**crackleware** (krak′'l-wâr′), *n.* گلێنەیەك کە درزی باریکی وەك نەقشی لەسەر کرابێت.
**crackling** (krak′liŋ), *n.* (١) قرچەقرچ؛ تەقینەوە (داری ناو ئاگر).
(٢) دیوی دەرەوەی گۆشتی سوورەوەکراوی بەراز کە وەك قاوورمە ووشکە.
**crackly** (krak′li), *adj.* قرچۆك؛ ووشك.
**cracknel** (krak′n'l), *n.* (١) بسکویتێکی ووشکی ڕەق.
(٢) پارچە گۆشتی ووردی سوورەوەکراوی بەراز.
**crack of doom,** نیشانەی ڕۆژی قیامەت.
**crackpot** (krak′pot′), *n.* [Colloq.], کەسێکی شێتۆکەو سەیرو خاوەن بیروباوەڕی نائاسایی.
*adj.* سەیرو شێتۆکەو خاوەن بیری سەیر.
**cracksman** (kraks′mən), *n.* [Slang], دز؛ ماڵبڕ.
**crackup** (krak′up′), *n.* (١) لێکدانی ئوتومبیل‌و شکانی.
(٢) ڕووخان (مێشك یا لەش)؛ مێشك تێکچوون.
**-cracy** (krə-si), پاشگرێکە بەمانای: فەرمانڕەوایی؛ جۆری فەرمانڕەوایی: *(democracy, autocracy)*
**cradle** (krā′d'l), *n.* (١) بێشکە؛ لانك؛ لانکە.
(٢) کاتی ساوایی یا منداڵی.
(٣) شوێنی لەدایکبوون، سەرەتا، یا دەستپێکردنی شتێك (بیروباوەڕ، ئاین، شارستانێتی... هتد): *(the ~ of civilization)*.
(٤) [Poetic]، شوێنی حەوانەوە.
(٥) چوارچێوەیەکی شیش‌و گوریس.
(٦) تەختەیەکی پێچکەدارە فیتەر بەکاری دێنێت بۆ کارکردن لەژێر ئوتومبیلدا.
(٧) چوارچێوەیەکی دار یا ئاسن بۆ لەسەردانانی بەلەم، پاپۆڕ، یا فڕۆکە لەکاتی درووستکردن، چاکردن، یا بەرزکردنەوەدا.
(٨) سێپای تەلەفۆن: ئەو بەشەی تەلەفۆن کە بیستۆکەکەی دەخرێتە سەر.
(٩) چوارچێوەیەکە دەبەسترێت بە داسەوە لەکاتی درونەدا وەك پەنجەکانی دەست وەهایە.
(١٠) چوارچێوەیەکە وەك بێژنگ بۆ شۆردنەوەو جیاکردنەوەی زێڕ لە لم.
*v.t.* (١) ڕاژەندن؛ خستنە بێشکەوە. (٢) پەروەردەکردن.
(٣) دروێنەکردنی دەغڵ‌ودان بە داسێك کە چوارچێوەیەکی پێوەبەستراوە وەك پەنجەکانی دەست وەهایە. (٤) دانان یا بەرزکردنەوەی بەلەمێك بە چوارچێوەی تایبەتی. (٥) جیاکردنەوەی زێڕ لەو لمەی کە زێڕی تێدایە بە بێژنگی تایبەت.
*v.i.* ڕاکشان لە بێشکەدا.
**rob the cradle,** ژنی زۆر لە خۆ منداڵتر هێنان.
**cradlesong** (krā′d'l-sôŋ′), *n.* لایلایە.
**craft** (kraft, kräft), *n.* (١) کارامەیی؛ دانایی؛ شارەزایی.
(٢) فێڵبازی؛ کەڵەکچێتی. (٣) پیشەگەری؛ پیشەسازی؛ پیشە.
(٤) (ا) ئەندامانی پیشەگەرییەك. (ب) ئەندامانی یەکێتی پیشەگەرییەك.
(٥) بەلەم، پاپۆڕ یا فڕۆکە.
**-craft** (kraft, kräft), پاشگرێکە بەمانای: پیشە؛ پیشەگەری؛ کارامەیی؛ دانایی؛ شارەزایی: *(handicraft, witchcraft)*.
**craftiness** (kraf′ti-nis, kräf′ti-nis), *n.* فێڵبازی؛ کەڵەکچێتی.
**craftsman** (krafts′mən, kräfts′mən), *n.* (١) پیشەگەر؛ وەستا.
(٢) هونەرمەند.
**craftsmanship** (krafts′mən-ship′, kräfts′mən-ship′), *n.* وەستایی؛ شارەزایی؛ دانایی؛ کارامەیی.
**craft union,** یەکێتی ئەندامانی پیشەگەرییەك.
**crafty** (kraf′ti, kräf′ti), *adj.* فێڵباز؛ زۆرزان؛ تەڵەکەباز؛ زۆڵ.
**-craftly** *(adv.).*
**crag** (krag), *n.* بەردێکی سەخت‌و لێژ (بەتایبەتی کە سەری هێنابێتە دەرەوە لە شاخ یا کەندەڵانێکدا)؛ کەندەڵانێکی سەخت‌و لێژ.

**cragged** (krag′id), *adj.* = craggy.
**craggy** (krag′i), *adj.* سەخت‌و لێژ (شاخ، کەندەڵان، بەرد)؛ بەردانی‌و سەخت؛ گرنج گرنج یا قۆرتاوی (دەم‌وچاو).
-cragginess *(n.).*
**cragsman** (kragz′mən), *n.* شاخەوان.
**cram** (kram), *v.t.* (١) (ا) ئاخنین؛ زۆر پڕکردن. (ب) تێ ترنجاندن؛ تێ خزاندن. (٢) زۆر خواردن. (٣) [Colloq.]، کۆشش کردن‌و مێشکی خۆ یا یەکێکی تر ئاخنین بە زانیاری بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەیەك بەتایبەتی ماوەیەکی کورت لەپێش تاقیکردنەوەدا.
*v.i.* (١) زۆر خواردن یا بەپەلە خواردن.
(٢) [Colloq.]، کۆشش کردن‌و مێشکی خۆ یا یەکێکی تر ئاخنین بە زانیاری بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ تاقیکردنەوەیەك بەتایبەتی ماوەیەکی کورت.
*n.* (١) [Colloq.] ، تێ ترنجان؛ تێ خزان؛ تێ ئاخنین.
(٢) (ا) مێشکی خۆ ئاخنین بە زانیاری بۆ تاقیکردنەوەیەك (بەتایبەتی لە ماوەیەکی کورتدا لەپێش تاقیکردنەوەکە). (ب) ئەو زانیارییەی بەم شێوەیە دەئاخنرێتە مێشکەوە.
**cramp** (kramp), *n.* (١) کۆڵنج؛ ئازاری ماسولکە ڕەق بوون.
(٢) ووشك بوون یا گۆج بوونی کاتی ماسولکەیەکی زۆر بەکارهێنراو.
(٣) (*pl.*)، ژانەسك؛ باپێچ؛ پێچ.
*v.t.* کۆڵنج پێکردن؛ هاتنە ژان.
**cramp** (kramp), *n.* (١) قولاپ؛ شیشێکی ئاسن کە هەردوو سەرەکەی نووشتێنرابێتەوە. (٢) گیرە. (٣) کۆسپ؛ جڵەو؛ ڕاگیرکەر؛ پەستەرەوە.
(٤) بارێکی تەنگەبەرو پەستکەر.
*v.t.* (١) بە گیرە قایم کردن یا بەستنەوە. (٢) بەستنەوە؛ قەتیس کردن؛ ڕێگرتن.
(٣) لێخوڕین (ئوتومبیل).
*adj.* (١) قەتیس؛ بەستراوە؛ ڕێ لێ گیراو. (٢) ناخوێنرێتەوە (دەستنووس).
**cramp one's style,** [Slang], باری ژیان تێکدان؛ دەست بەستنەوە؛ ڕێ لێگرتن‌و بەستنەوەی کارامەیی‌و لێهاتوویی ئاسایی کەسێك.
**cramped** (krampt), *adj.* (١) (ا) تەنگەبەر؛ تەسك؛ پڕو تەسك. (ب) مێشك تەسك. (٢) ناخوێنرێتەوە لەبەر پڕی نووسینەکەو کەمی جێگە (دەستنووس): *(~ handwriting)*.
**crampfish** (kramp′fish′), *n.* ماسییەکە تەزووی کارەبایی لێوە دەردەچێت (هەروەها پێشی دەووترێ: " **electric ray** "، " **torpedo fish** ").
**crampon** (kram′pən), *n.* (١) قولاپ (بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی).
(٢) بزماری بنی پێڵاو (بۆ نەخلیسکان لەسەر سەهۆڵ).
**crampoon** (kram-pōōn′), *n.* = crampon.
**cranberry** (kran′ber′i, kran′bĕr-i), *n.* (١) تووترك.
(٢) ڕووەکی تووترك.
**crane** (krān), *n.* (١) قولنگ. (٢) هەرچ باڵندەیەك کە لە قولنگ بچێت (وەك شینەشاهۆ). (٣) کرەین؛ مەکینەی بەرزکەرەوە (خانووسازی).
*v.t.* (١) بەرزکردنەوە بە ئامێری " کرەین ".
(٢) مل درێژکردن‌و بەرزکردنەوە بۆ باشتر بینینی دیمەنێك.
*v.i.* (١) مل بەرزکردنەوەو درێژکردن بۆ باشتر بینینی دیمەنێك.
(٢) سڵ کردنەوە؛ دوودڵی کردن.
**crane's-bill, cranesbill** (krānz′bil′), *n.* ساردۆنیای کێوی.
**cranial** (krā′ni-əl), *adj.* کاسەسەری؛ کەللەسەری؛ هی کەللەی سەر.
**craniate** (krā′ni-it), *adj.* کاسەسەردار (وەك گیانداری شیردەر، باڵندە، ماسی‌و خشۆك).
*n.* گیاندارێك کە کاسەی سەری هەبێت.
**craniology** (krā′ni-ol′ə-ji), *n.* کاسەی سەر زانی: زانستی- لێکۆڵینەوەی کاسەی سەر بەتایبەتی هی مرۆڤ‌و تایبەخۆکانیان‌و جیاوازی قەوارەو شێوەیان.
**craniometer** (krā′ni-om′ə-tĕr), *n.* ئامێری پێوانی کاسەی سەر.
**craniometry** (krā′ni-om′ə-tri), *n.* زانستی پێوانی کاسەی سەر.

**craniotomy** (krā´ni-ot′ɔ-mi), *n.* نەشتەرگەری کاسەی سەر.
**cranium** (krā′ni-əm), *n.* کاسەی سەر؛ کەللەسەر.
**crank** (kraŋk), *n.* (١) (ا) هەندل (ئوتومبیل). (ب) دەسك.
(٢) حولحولێتی؛ هەوەسکاری؛ هەوەسبازی. (٣) کردەوە یا بیرێکی سەیرو
ناناسایی. (٤) [Colloq.]، کەسێکی سەیر (خوو، کردەوە، بیروباوەڕ).
(٥) [Colloq.]، کەسێکی تەنگەجیکلانەو تووڕەوتڕۆو بەسکالا.
*v.t.* (١) هەندل لێدان؛ سلف لێدان (ئوتومبیل)؛ توتومبیل خستنەگەڕ بە هەندل
یا سلف لێدان. (٢) وەك هەندل لێکردن؛ بادان و خواروخێچ کردن.
(٣) هەندل پێدان.
*v.i.* (١) هەندل لێدان؛ خستنەگەڕی ئوتومبیل بە هەندل لێدان.
(٢) [Obs.]، بادان و خواروخێچ کردن.
**crank** (kraŋk), *adj.* (١) لەوانەیە وەرگەڕێت لەبەر شلۆقی (بەلەم).
(٢) شلۆق.
**crank** (kraŋk), *adj.* [Dial.], بەکەیف؛ وریا و کەیف خۆش.
**crankcase** (kraŋk′kās´), *n.* سنووقی شەفت (مەکینەی ئوتومبیل).
**crankshaft** (kraŋk′shaft´, kraŋk′shäft´), *n.* شەفت (مەکینەی
ئوتومبیل)
**cranky** (kraŋ′ki), *adj.* (١) تەنگەجیکلانەو تووڕەوتڕۆو بەسکالا.
(٢) سەیر (مرۆڤ بە کردەوە، خوو. یا بیروباوەڕ).
(٣) (ا) شل؛ لە گێڕ چووەتە دەرەوە. (ب) خراپ؛ شکاو. (٤) خواروخێچ.
(٥) شلۆقەو لەوانەیە وەرگەڕێت (بەلەم).
-**crankily** *(adv.)*; **crankiness** *(n.)*.
**cranny** (kran′i), *n.* درز (دیوار، بەرد)؛ قلیش؛ تلیش.
**crap** (krap), *n.* (١) جۆرە قومارێکە بە دوو زار دەکرێت.
(٢) زار نەهاتنێکی خراپ لەم قومارەدا. (٣) [Vulgar]، گوو؛ پیسایی.
(٤) [Vulgar Slang]، قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ.
(٥) [Vulgar Slang]، شتێکی بێ فەڕ.
**crap out,** (١) زارێکی خراپ بۆ هاتن لە قوماری " کراپس " دا.
(٢) [Slang]، ژێرکەوتن؛ نشوستی هێنان.
**crape** (krāp), *n. Also* **crepe,** (١) قوماشێکی تەنکی کرژ (خوری،
کەتان، ئوریشم). (٢) شریتێکی ڕەش لەم جۆرە قوماشە کە دەبەسترێت بە
باڵەوە لەکاتی شیندا.
**crapehanger** (krāp′haŋ´ẽr), *n.* کەسێکی ڕەشبین.
**crape myrtle,** دارێکی بچووکە گوڵی سوورو سپی و پەمەیی دەگرێت.
**crappie** (krap′i), *n. Also* **croppie,** جۆرە ماسییەکە.
**craps** (kraps), *n.pl.* کراپس قومارێکە بە دوو زار دەکرێت.
**crapshooter** (krap′shōōt´ẽr), *n.* قومارکەری " کراپس " (ووشەی
پێشوو ببینە)
**crapulence** (krap′yoo-ləns), *n.* (١) نەخۆش کەوتنێك کە
لەئەنجامی زۆر خواردن یا زۆر خواردنەوەوە بێت. (٢) خواردن یا خواردنەوەی
زۆرو لە ڕادە بەدەر
-**crampulent** *(adj.)*; **crampulous** *(adj.)*.
**crash** (krash), *v.i.* (١) کەوتن، کەوتنەخوارەوە، یا لێکدان بە دەنگێکی
زل و شکان یا ووردوخاش بوون؛ وەرگەڕان (ئوتومبیل).
(٢) دەنگێکی گەورە پەیدابوون لەکاتی شکان یا کەوتنەخوارەوەدا؛ ڕووخان و
دەنگێکی گەورە پەیدابوون؛ هاڕەهاتن. (٣) بزووتنەوە بە دەنگێکی زلەوە.
(٤) کەوتنەخوارەوەو شکان یا ووردوخاش بوون (فڕۆکە)؛
نیشتنەوەی توندوتیژو هەندێك زیان لێکەوتن (فڕۆکە).
(٥) هەرەس بردن یا ڕووخانی بەپەلە (بازرگانی): *( Their business ~ed.)* .
*v.t.* (١) شکاندن، لێکدان، خستنەخوارەوە، یا ووردوخاش کردن (ئوتومبیل،
فڕۆکە). (٢) پێداکردن بە دەنگێکی بەرز. (٣) ووردوخاش کردن؛ شەق پێ بردن.
(٤) [Colloq.]، خۆداکوتان لە ئاهەنگێکدا بەبێ بانگ کردن؛ بەزۆر چوونە
تیاترۆ یا سینەمایەکەوە بەبێ بلیت: *( We ~ed the party.)* .
*n.* (١) هاڕە؛ شەقە؛ تەقە؛ تەپەیەکی زل.
(٢) لێکدان، شکان، یا کەوتنەخوارەوە (ئوتومبیل، فڕۆکە)
(٣) ژێرکەوتنێکی پەلە (بازرگانی)؛ هەرەس بردن یا ڕووخانێکی پەلەو
چاوەڕوان نەکراو (باری ئابووری وڵات، بازرگانی).
*adj.* [Colloq.]. بە پەلەو هەموو هێزو توانایەکەوە (بۆ کردن و سەرکەوتنی
کارێك): *( a ~ course; a ~ program to build highways)* .
**crash** (krash), *n.* قوماشێکی زبر.
**crash dive,** خۆ نوقوم کردنێکی بە پەلەو ناکاوی ژێردەریایی‌یەك (بۆ
دەربازبوون لە هێرشی دوژمن).
**crash-land** (krash′land´), *v.t.* نیشتنەوەی فڕۆکەیەك بە پەلەو
لەناکاویداو گەلێك جار تێك‌وپێکدانی.
**crass** (kras), *adj.* (١) کەرو نەفام؛ هیچ نەزان و کەرتڕی تەواو.
(٢) [Rare]، زبر؛ ئەستوور. (٣) تەواو: *( ~ ignorance)* .
-**crassly** *(adv.)*; **crassness** *(n.)*.
**crassitude** (kras′ə-tōōd´, kras′ə-tūd´), *n.* کەرتڕی و نەزانی؛
زۆر کەری و نەفامی.
-**crat** (krat), پاشگرێکە بەمانای: (ا) پاڵپشتکەری ڕژێمێك یا ڕێبازێکی
ڕامیاری و فەلسەفی: *( democrat)* .
(ب) ئەندامی پارتێکی کۆمەڵایەتی: *( aristocrat)* .
**cratch** (krach), *n.* [Dial.], ئاخوڕ.
**crate** (krāt), *n.* (١) سنووقی تەختە یا سەبەتە (بۆ گواستنەوەی شتی
فرۆتەنی یا عەمارکردنی). (٢) ئەو شتومەکەی دەکرێتە سنووقێکی وەهاوە
(٣) [Slang]، ئوتومبیل یا فڕۆکەیەکی کۆن و پەککەوتە.
*v.t.* شتومەك خستنە ناو سنووقێکی تەختەی وەهاوە.
**crater** (krā′tẽr), *n.* (١) چاڵایی دەمی ئاگرپژێن یا قەڵبەزەیەکی گەرم.
(٢) چاڵێك کە لە تەقینەوەی بۆمباوە لە زەویدا دروست دەبێت؛ چاڵ؛ چاڵایی.
(٣) دەفری تێکەڵاوکردنی شەراب لە یۆنانی کۆندا.
**craunch** (kränch, krônch), *v.t. & v.i.* = **crunch.**
**cravat** (krə-vat′), *n.* (١) ملپێچ؛ ملبەند. (٢) بۆینباخ.
**crave** (krāv), *v.t.* (١) بێزووپێوەکردن؛ تامەزرۆبوون؛ زۆر حەزلێکردن.
(٢) پاڕانەوە.
*v.i.* بێزووکردن؛ تامەزرۆبوون.
**craven** (krā′vən), *adj.* ترسنۆك؛ بێ غیرەت.
*n.* کەسێکی ترسنۆك یا بێ غیرەت.
**cry craven,** خۆ بەدەستەوەدان.
**craving** (krāv′iŋ), *n.* بێزوو؛ حەز یا ئارەزوویەکی ئێجگار زۆر.
**craw** (krô), *n.* (١) چیکڵانەی باڵندە. (٢) گەدەی گیاندار.
**to stick in the (or one's) craw,** بەدڵ نەبوون؛ پەسەندنەکردن.
**crawfish** (krô′fish´), *n. Also* **crayfish,** گیاندارێکی بچووکی
ئاوی قاوغدارە لە کوولەی ئاو دەچێت.
*v.t.* [Colloq.]. (~ **out**), خۆکشانەوە.
**crawl** (krôl), *v.i.* (١) بە خشکە ڕۆیشتن (مار، کرم)؛ خشان بەسەر زەویدا.
(٢) گاگۆڵکێ کردن؛ بە قنگەخشکێ ڕۆیشتن. (٣) زۆر بە هێواشی ڕۆیشتن (کات).
(٤) مێروولەکردن (قاچ، دەست، ڕان... هتد).
(٥) سەرشۆڕکردن؛ بە سەرشۆڕی جووڵانەوە.
(٦) مەلەکردن لە کونجێکی تەیمان کراودا لە تەنکاوێکدا (ئەم تەیمان کردنە بۆ
گرتنی ماسی و جلە دەکرێت).
*n.* (١) خشان؛ بە خشکەیی ڕۆیشتن. (٢) گاگۆڵکێ؛ قنگەخشکێ.
(٣) باسکەمەلە.
**crawl** (krôl), *n.* کونجێکی تەیمان کراو لەناو تەنکاوێکدا بۆ گرتنی جلەو
ماسی.
**crayfish** (krā′fish´), *n.* گیاندارێکی بچووکی ئاوی قاوغدارە لە
کوولەی ئاو دەچێت.
**crayon** (krā′ɔn, krā′on), *n.* (١) پێنووسی بۆیە؛ قەڵەمی بۆیە.
(٢) نیگاری پێنووسی بۆیە.
*v.t.* وێنەکێشان بە پێنووسی بۆیە.
**craze** (krāz), *v.t.* (١) شێت کردن؛ مێشك تێکدان.

(۲) درزی بچووک کردنە گۆزەودیزەوە.

*v.i.* (۱) شێت بوون؛ مێشك تێکچوون.

(۲) درزی بچووک تێ بوون (گۆزەودیزە).

*n.* (۱) ئێجگار زۆر حەزلێکردن یا شێت بوونی خەلك بۆ شتێك کە بووبێت بە باو: ***( Jogging or running is the latest ~ .)***

(۲) مۆدە؛ مۆدەیەکی سەردەمی؛ خولیا.

(۳) درزێکی بچووک لە گۆزەودیزەدا.

**crazed** (krāzd), ***adj.*** (۱) شێت (۲) شێتوشەیدا؛ دێوانە.

(۳) درزی بچکۆلەدار (گۆزەودیزە).

**craziness** (krā′zi-nis), ***n.*** شێتی؛ بێ مێشکی؛ دێوانەیی.

**crazy** (krā′zi), ***adj.*** (۱) شێت؛ بێ مێشك.

(۲) [Colloq.]، شێتوشەیدا؛ دێوانە: ***( He is ~ about her.)*** .

(۳) درزاوی؛ درز تێ بوو؛ پەرپووت؛ شلۆق.

**-crazily** ***(adv.).***

**like crazy**, [Colloq.], زۆر بەجۆشەوەو بە پەلەو بەوپەڕی ووزەو توانایەوە: ***( He is working like crazy.)*** .

**crazy bone,** ئیسقانی ئانیشك.

**crazy quilt,** لێفەی هەمەڕەنگو پەلەپەڵەوی.

**crazyweed** (krā′zi-wēd′), ***n.*** ڕووەکێکی ژەهراوییە (کە ئاژەل دەیخوات ژەهر ئەی دەدات).

**creak** (krēk), ***v.i. & v.t.*** جیرەجیرکردن؛ جیرەجیرهاتن؛ قرچەقرچ کردن.

***n.*** جیرەجیر؛ جیرە؛ قرچە.

**creaky** (krēk′i), ***adj.*** (۱) جیرەجیرکەر.

(۲) پەرپووت (خانوو، پرد)؛ کۆنو جیرەجیرکەر (دەرگا).

**-creakily** ***(adv.)***; **creakiness** ***(n.).***

**cream** (krēm), ***n.*** (۱) سەرتوێژ؛ قەتماغەی شیر؛ قەیماغ؛ شیری خەست.

(۲) خواردەمەنییەکە کە لە سەرتوێژ دروستکرابێت یا وەك سەرتوێژ خۆی گرتبێت: ***( ice ~ )*** . (۳) کرێم: ئارایشتێکە لە دەموچاو دەدرێت.

(٤) خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری خەستە.

(٥) باشترین بەشی شتێك؛ سەرتوێژ (مەجاز):

***( These students are the ~ of the crop.)***

(٦) ڕەنگی سپی زەردباو؛ ڕەنگی شیری.

***adj.*** (۱) تایبەتی بە سەرتوێژ؛ لە سەرتوێژ دروستکراو.

(۲) وەك سەرتوێژ خۆی دەگرێت؛ وەك کرێم خۆی دەگرێت.

(۳) سپی زەردباو.

***v.i.*** سەرتوێژ بەستن؛ سەرتوێژ گرتن.

***v.t.*** (۱) سەرتوێژ لابردن یا گرتنەوە. (۲) باشترین بەش یا چین لابردن.

(۳) (ا) شیری زۆر خەست تێکردن (قاوە، چا).

(ب) بە شیری خەست لێنان (چێشت).

(٤) تێکهەڵدان و گرتنەوەی شتێك تا وەك شیری خەستی لێ دێت.

(٥) سەرتوێژ بەستن بە شیر.

**cream cheese,** پەنیرێکی نەرمە وەك قەیماغ وایە.

**cream-colored** (krēm′kul′ērd), ***adj.*** سپی زەردباو؛ شیری (ڕەنگ).

**creamer** (krēm′ēr), ***n.*** (۱) سوراحی یا دەفرێکی زۆر بچووك بۆ شیری خەست تێکردن. (۲) ئامێری جیاکردنەوەی سەرتوێژ لە شیر.

(۳) بەفرگرەیەکە شیری تێ دەخرێت بۆئەوەی سەرتوێژ ببەستێت.

**creamery** (krēm′ēr-i), ***n.*** (۱) کارگەی شیرەمەنی؛ کارگەی پاكژ- کردنی شیرو دروستکردنی پەنیرو کەرە. (۲) فرۆشگای شیرەمەنی.

(۳) شوێنی دانانی شیر بۆ قەتماغە بەستن.

**creamy** (krēm′i), ***adj.*** (۱) پڕ لە سەرتوێژ؛ چەور.

(۲) وەك سەرتوێژ وایە لە خۆگرتن و ڕووالەتدا.

(۳) سپی زەردباو؛ شیری (ڕەنگ).

**crease** (krēs), ***n.*** (۱) خەتی پانتۆڵی ئوتوودراو؛ خەتی جلوبەرگی قەد کراو. (۲) چرچولۆچ (جلوبەرگ).

(۳) هێڵی ناو گۆڕەپان (یاری " کریکێت " و " هۆکی " ) .

***v.t.*** (۱) ئوتوکردن یا قەدکردن و خەت تێدا پەیداکردن (جلوبەرگ).

(۲) چرچولۆچ کردن. (۳) ڕووشاندن بە گوللە؛ بەئاستەم بریندارکردن بە گوللە.

***v.i.*** چرچولۆچ بوون؛ هێڵ تێکەوتن (بە ئوتوکردن یا قەدکردن).

**-creasy** ***(adj.).***

**create** (krē-āt′, kri-āt′), ***v.t.*** (۱) هێنانە جیهانەوە؛ هێنانە بوون؛ گیان بە بەردا کردن. (۲) دامەزراندن؛ دروستکردن. (۳) داهێنان.

(٤) دروستکردن؛ بوون بە هۆ: ***( It ~d a lot of problems for him.)*** .

**creatine** (krē′ə-tēn′, krē′ə-tin), ***n. Also*** **creatin,** کریاتین: ماددەیەکی سپی بلوورییە (لە تێشووی ماسولکەی گیاندارە بڕبڕەدارەکاندا هەیە).

**creation** (krē-ā′shən, kri-ā′shən), ***n.*** (۱) هێنانە جیهانەوە؛ هاتنە بوونەوە؛ هاتنە جیهانەوە؛ پەیدابوون.

(۲) دروستکردن؛ دامەزراندن. (۳) داهێنان؛ دۆزینەوە؛ داهاتن.

(٤) جیهان؛ جیهان و هەمووشتێکی ناوی.

(٥) شتێکی تازە داهێنراو یا تازە دۆزراوە.

**the Creation,** دروستکردنی جیهان لەلایەن خوداوە؛ دروستبوونی جیهان.

**creationism** (krē-ā′shən-iz′m, kri-ā′shən-iz′m), ***n.*** (۱) - بیروباوەڕێکە دەڵێت: خودا هەموو گیاندارو شتێکی سەر زەوی دروستکردووەو هەر لەخۆیانەوە یا لەئەنجامی گۆڕیندا پەیدا نەبوون (ئاین).

(۲) بیروباوەڕێکە دەڵێت: خودا گیان دەکات بە بەری هەموو ئادەمیزادێکدا کە لەدایك دەبێت.

**-creationist** ***(n.).***

**creative** (krē-ā′tiv, kri-ā′tiv), ***adj.*** داهێنەر؛ خاوەن بیر؛ دانا؛ بەهرەدار.

**-creatively** ***(adv.)***; **creativeness** ***(n.).***

**creativity** (krē′ā-tiv′ə-ti), ***n.*** توانای داهێنان هەبوون؛ داهێنان؛ بەهرەداری؛ دانایی.

**creator** (krē-ā′tēr, kri-ā′tēr), ***n.*** (۱) داهێنەر؛ دروستکەر.

(۲) [C-]، خودا؛ یەزدان؛ کردگار.

**creature** (krē′chēr), ***n.*** (۱) دروستکراوێك (زیندوو یا نازیندوو).

(۲) زیندەوەر؛ بوونەوەر؛ گیاندار، بەتایبەتی: (ا) وڵاخ یا ئاژەل.

(ب) ئادەمیزاد (لەڕووی سووکی، بەزەیی، یا خۆشەویستییەوە بەکاردێت).

(۳) جانەوەر؛ دەعبا. (٤) دەسکەلا؛ داردەست؛ کەسێك کە چاوبەرەوژێری کەسێکی تر بێت بۆ هەموو سەرکەوتنێکی و شتێك کە هەیەتی و هەمیشەش لەژێر ڕکێفیدا بێت.

**the creature,** ویسکی یا خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری تر (لەڕووی گاڵتەوە).

**creature comfort,** شتی ئاسوودەبەخش (خواردەمەنی، جلوبەرگ، شوێنی حەوانەوە... هتد).

**crèche** (krāsh, kresh), ***n.*** (۱) وێنە یا نموونەی ئەو تەویلەیەی کە حەزرەتی مەسیحی تێدا لەدایك بووە. (۲) دایەنگە؛ شوێنی چاودێری کردنی منداڵان. (۳) نەخۆشخانە یا پەناگای منداڵی زۆڵ.

**credence** (krē′d′ns), ***n.*** (۱) بڕوا؛ باوەڕ؛ بڕواپێکردن:

***( Give no ~ to rumors.)***

(۲) بڕوانامە: ***( a letter of ~ )*** .

(۳) خوانی شێوی خودایی (کڵێسە).

**credendum** (kri-den′dəm), ***n.*** بڕوا (ئاین).

**credential** (kri-den′shəl), ***n.*** (۱) بڕواپێدەر.

(۲) (*pl.*)، بڕوانامە (باڵیۆز، نوێنەر، داواکاری کارێك... هتد)؛ بەڵگەنامە؛ پێناس؛ قەواڵە.

**credenza** (kri-den′zə), ***n.*** (۱) دۆلابی پەرتووك و شتی وەها.

(۲) خوان.

**credibility** (kred′ə-bil′ə-ti), ***n.*** بڕوا؛ بڕوا پێ بوون؛ بڕواپێکردن؛

باوەڕ پێ بوون؛ جێی بڕوابوون.

**credible** (kred′ə-b'l), *adj.* جێی بڕوایە؛ بڕوای پێ دەکرێت؛ باوەڕپێکراو؛ دەچێتە مێشکەوە.

**credit** (kred′it), *n.* (١) بڕوا؛ باوەڕ. (٢) جێی بڕوابوون؛ بڕوا پێ بوون.
(٣) ناوبانگ؛ ناوی باش؛ ناو. (٤) بایەخ.
(٥) ستایش: *( He deserves ~ for telling the truth.)*.
(٦) جێی شانازی: *( He is a ~ to his nation.)*.
(٧) (*pl.*)، دان نان بە بەشداربوونی ئەوانەی دەستیان هەبووە لە هێنانەدی شتێکدا (وەك فیلمی سینەما).
(٨) مایە؛ سەرمایە؛ ئەو دراوەیە کە ماوە لە حسابی کەسێکدا لە بانقدا.
(٩) قەرز؛ قەرزوقۆڵە؛ قەرزکاری: *( He never buys on ~ .)*.
(١٠) ئەو بەشەی قەرزێك کە دەدرێتەوە یا دراوەتەوە.
(١١) (ا) وانەکانی کۆرسێك کە قوتابی لە زانکۆدا دەیخوێنێت و نمرەی لەسەر وەردەگرێت (ب) تۆمارکردنی ئەو کۆرسانەی کە قوتابی تەواوی کردووە لە بڕوانامەکەیدا
*v.t.* (١) بڕواپێکردن. (٢) جێی شانازی بوون؛ جێی شانازی پێوەکردن بوون.
(٣) ستایش کردن؛ چاکە وتن.
(٤) لە قەرز دەرکردن؛ لە حسابی کەسێك دەرکردن (بانق).
(٥) تۆمارکردنی کۆرسی تەواوکراو لە بڕوانامەی قوتابییەکدا.

**credit one with,** شتی چاکە خستنەپاڵ.
**do credit to,** جێی شانازی بوون.
**give credit to,** (١) بڕواپێکردن؛ هەق پێدان. (٢) ستایش کردن.
**give one credit for,** هەق پێدان؛ ستایش کردن بۆ کردەوەیەکی باش.
**letter of credit,** باوەڕنامەی دارایی (بانق).
**on credit,** بە قەرز
**to one's credit,** جێی شانازی بوون بۆ کەسێك.

**creditable** (kred′it-ə-b'l), *adj.* (١) جێی شانازی یا ستایشە
(٢) دەتوانرێت بدرێتە پاڵ کەسێك یا لایەك.

**credit line,** (١) ناوبردن یا دان نان بە بەشداربوونی کەسێك لە کارێکدا (فیلمی سینەمایی، دەنگوباس و وتاری ڕۆژنامە).
(٢) ڕادەی ئەوپەڕی قەرز کە دەدرێت بە کەسێك یا دەزگایەك.
(هەروەها پێی دەوترێ: " line of credit ").

**credit card,** کارتی قەرز

**creditor** (kred′i-tēr), *n.* خاوەن قەرز؛ قەرزدەر

**credit union,** کۆمەڵەی هەرەوەزی قەرزکاری: کۆمەڵەیەکی هەرەوەزییە قەرز دەدات بە ئەندامەکانی بە قازانجێکی کەم

**credo** (krē′dō, krā′dō), *n.* بڕوا؛ باوەڕ؛ بیروباوەڕ.

**credulity** (krə-do͞o′lə-ti, krə-dū′lə-ti), *n.* خۆشباوەڕیی؛ ساویلکەیی.

**credulous** (krej′oo-ləs), *adj.* خۆشباوەڕ؛ ساویلکە.

**creed** (krēd), *n.* (١) بیروباوەڕی ئاینی. (٢) بڕوا؛ ڕێباز.

**creek** (krēk, krik), *n.* (١) جۆگە؛ جۆگەلە؛ چەم.
(٢) کەنداوێکی تەسك یا بچووك.

**creel** (krēl), *n.* (١) زەمیلەی ماسی گر (کە ماسی گیراوی تێ دەکرێت).
(٢) زەمیلەی ماسی گرتن: زەمیلەیەکە ماسی و گوێچکەماسی پێ ڕاودەکرێت.
(٣) چوارچێوەی ڕاگیرکەری خولخولۆکەی ڕستن.

**creep** (krēp), *v.i.* (١) خشان؛ بەسەر سکدا خشان؛ بەسەر زەویدا خشان.
(٢) بە هێواشی جووڵانەوە؛ لەسەرخۆ بزووان.
(٣) بەدزییەوە یا بەترسەوە بزووان.
(٤) ( ~ up )، پەیدابوون و پەرەسەندنی بەرەبەرە و بەبێ سەرنج ڕاکێشان.
(٥) کرژبوون (لەش). (٦) مێروولەکردن (پێست، لەش).
(٧) هەڵگەڕان بە دیوار، یا شتی تردا (ڕووەك). (٨) خواربوون (کانزا).
*n.* (١) خشان؛ بەسەر سکدا خشان. (٢) جووڵانەوەیەکی لەسەرخۆ یا بەترسەوە.
(٣) [Slang]، کەسێکی پیس و بۆگەن و بێ نرخ.

**give one the creeps,** [Colloq.], قیزلێهاتنەوە و ترس لێ نیشتن و قین هەڵسان.

**make one's flesh creep,** بوون بە هۆی ترس لێ نیشتن و قیزلێهاتنەوە وەك ئەوەی جانەوەر بەسەر پێستدا بخشێت یا لەش مێروولە بکات.

**creeper** (krēp′ēr), *n.* (١) خشۆك (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).
(٢) ڕووەکێکی خۆهەڵواسەر بە دیواردا یا بەسەر زەویدا خشاو.
(٣) باڵندەیەکی خشاو بەسەر داردا (بەمەبەستی بژێوی).
(٤) ئامێرێکی قولاپدارە بنی ئەستێل و گۆم و دەریاچەی پێ هەڵدەکەنرێت.
(٥) (*pl.*)، ناڵێکی بزماراوییە دەدرێت لە بنی پێڵاو بۆ نەخلیسکان.
(٦) ئامێری گواستنەوەی شت بۆ مەکینەیەك یا لە بەشێکی مەکینەکەوە بۆ بەشێکی تری. (٧) (*pl.*)، بەرگی یەك پارچەی سەرتاپای منداڵ.

**creepy** (krēp′i), *adj.* (١) خشۆك. (٢) پیس و بۆگەن و ترسناك.

**creese** (krēs), *n.* خەنجەرێکی دەم لوول مالیزییە.

**cremate** (krē′māt, kri-māt′), *v.t.* سووتاندن (لاشەی مردوو لەبری ناشتنی).

**cremation** (kri-mā′shən), *n.* سووتاندنی لاشەی مردوو لەبری ناشتنی.

**cremator** (krē′mā-tēr, kri-mā′tēr), *n.* (١) سووتێنەری لاشەی مردوو (مرۆڤ). (٢) فڕنی تێدا سووتاندنی لاشەی مردوو.
(٣) کوورە یا ئاگردانی زبڵ و پاشەڕۆك سووتاندن.

**crematorium** (krē′mə-tôr′i-əm, krem′ə-tō′ri-əm), *n.* = crematory.

**crematory** (krē′mə-tôr′i, krem′ə-tō′ri), *n.* (١) کوورە یا فڕنی تێدا سووتاندنی لاشەی مردوو. (٢) خانوویەك کە فڕنێکی وەهای تێدابێت.
*adj.* تایبەتی بە سووتاندنی لاشەی مردوو.

**crème de cacao,** خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری شیرینە تامی کاکاو دەدات.

**crème de la crème,** سەرتوێژی سەرتوێژ، واتە هەرە باشترین یا یا باشترینی باشترین.

**crème de menthe,** خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری شیرینە تامی نەعنا دەدات.

**crenate** (krē′nāt), *adj.* دانەدار یا گرنج گرنج (گەڵا): *( a ~ leaf)*.

**crenation** (kri-nā′shən), *n.* دانەداری؛ گرنج گرنجی.

**crenature** (kren′ə-chēr, krē′nə-chēr), *n.* (١) گرنج گرنجییەك.
(٢) گرێ (گەڵای گرنج گرنجاوی).

**crenel, crenelle** (kren′'l), *n.* بۆشایی یا کونی سەر تارمەیەك کە وەك سەنگەر بەکاردەهێنرێت و تەقەی لێوە دەکرێت.

**crenelate, crenellate** (kren′'l-āt′), *v.t.* بۆشایی یا کون هێشتنەوە لە تارمەیەکدا کە وەك سەنگەر بەکاردەهێنرێت و تەقەی لێوە دەکرێت.
-crenelation, crenellation *(n.)*.

**crenulate** (kren′yoo-lit, kren′yoo-lāt′), *adj.* دانەدار یا گرنج گرنجاوی (گەڵا، گوێچکەماسی).

**crenulation** (kren′yoo-lā′shən), *n.* (١) دان؛ گرنج.
(٢) گرنج گرنجاویتی؛ دانەداری.

**Creole** (krē′ōl), *n.* (١) دانیشتوویەکی بنەچەیی دوورگەکانی هیندی ڕۆژئاوا، ئەمەریکای ناوەڕاست، بەشێك لە ئەمەریکای باشوور، یا ویلایەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای سەر کەنداوی مەکسیك.
(٢) کەسێك کە لە بنەچەی فەرەنسی یا ئیسپانی بێت و لە ئەمەریکا لەدایك بووبێت. (٣) [c-]، کەسێك کە لە بنەچەی قولەڕەش بێت و لە ئەمەریکا لەدایك بووبێت. (٤) کەسێك کە لە بنەچەی دانیشتووە فەرەنسییە کۆنەکانی ویلایەتی " لویزیانا " بێت. (٥) ئەو زمانە فەرەنسییەی ئەم جۆرە کەسانە ورتوێژی پێ دەکەن. (٦) دانیشتوویەکی ویلایەتی " لویزیانا " لە بەشی هەرە خوارەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. (٧) کەسێك لە بنەچەی دانیشتووە ئیسپانییە کۆنەکانی ویلایەتی " تەکساس " بێت.
(٨) [c-]، کەسێکی دوورەگ کە ڕەگێکی قولەڕەش بێت.

**creosol** (krē′ə-sōl′, krē′ə-sol′), *n.* شلەیەکی چەوری بێ ڕەنگی

تیژه بۆ دەرمان بەکاردێت (کیمیا)

**creosote** (krē′ə-sōt′), *n.* شلەیەکی چەوری ڕوونی بۆن تیژه بۆ دەرمان و پاراستنی تەختەو دار بەکاردەهێنرێت.

**crepe, crêpe** (krāp), *n.* (١) قوماشێکی تەنکی ژاکاوی ئاوریشم، کەتان، یا خوری. (٢) پارچەیەك قوماشی ڕەشی وەها کە بە قۆڵەوە دەبەسترێت لە شیندا (٣) پارچە کاغەزێکی تەنکی ژاکاو (هەروەها: crepe paper).

**crepitant** (krep′ə-tənt), *adj.* تەقەتەقکەر؛ قرچەقرچکەر.

**crepitate** (krep′ə-tāt′), *v.i.* تەقەتەق کردن؛ قرچەقرچ هاتن.

-crepitation *(n.).*

**crept** (krept), *past tense of* creep.

**crepuscle** (kri-pus′'l), *n.* تاریك و لێڵ؛ تاریك و ڕوون.

**crepuscular** (kri-pus′kyoo-lēr), *adj.* (١) تاریك و لێڵی؛ لێڵ؛ ناڕوون. (٢) شەوەکی؛ بە شەو هوشیاربوونەوەو چالاك بوون (جانەوەر).

**crescendo** (krə-shen′dō, krə-sen′dō), *adj. & adv.* بەرەبەرە بەرزبووەوە لەرووی دەنگو جۆش و توندوتیژییەوە (ئاوازی مۆسیقا).

*n.* بەرەبەرە بەرزبوونەوەی دەنگو جۆش و توندوتیژی ئاوازی مۆسیقا.

**crescent** (kres′'nt), *n.* (١) مانگی یەك شەوە؛ مانگی تازە. (٢) شتێك کە شێوەی لە دەمەداس یا مانگی تازە بچێت (ڕیزە خانوو). (٣) دروشمی تورکیا. (٤) (ا) هێزو دەسەلاتی تورکی. (ب) هێزو دەسەلاتی ئیسلام.

*adj.* (١) [Poetic]، پەرەسەندوو؛ گەشەکردوو. (٢) دەمەداسی؛ کەوانەیی.

**cress** (kres), *n.* تەرەتیزە

**cresset** (kres′it), *n.* چرا؛ مەشخەڵ؛ دەفرێکە نەوتی تێ دەکرێت و بە دار یا دیوارێکدا هەڵدەواسرێت و دادەگیرسێت وەك چرا.

**crest** (krest), *n.* (١) پۆپنەی کەڵەشێر؛ کلاوە (٢) پەرێك یا دروشمێك کە دەکرێت بە کلاوێکدا. (٣) کلاو. (٤) مۆر؛ دروشم. (٥) (ا) سەرلوتکە. (ب) تەوقەسەر (چیا، گرد)؛ لێوار؛ تیرە. (ج) ئەوپەڕی بەرزی یا سەرکەوتن (٦) (ا) ڕەوەی مل (ئەسپ، شێر). (ب) یالی ئەسپ و ماین یا شێر. (٧) بەرزایی ئێسقانێك. (٨) [Archaic]، نازایی؛ شانازی.

*v.t.* (١) ڕازاندنەوە بە پۆپنە، کلاوە، یا پەڕ. (٢) خستنەسەر سەر. (٣) بەرزبوونەوەو گەیشتنە تەوقەسەر یا لێوار (ڕووبار).

*v.i.* وەك تیرە لێهاتن (شەپۆل).

**crested** (kres′tid), *adj.* پۆپنەدار.

**crestfallen** (krest′fôl′'n), *adj.* (١) پۆپنەشکاو؛ پۆپنەخوار. (٢) غەمبار؛ بەزیو؛ پەست.

**cretaceous** (kri-tā′shəs), *adj.* (١) تەباشیری؛ گەچی؛ تایبەتی بە تەباشیر یا گەچ. (٢) [C-]، تایبەتی بە چەرخی تەباشیری یا گەچی.

**the Cretaceous,** چەرخی تەباشیری یا گەچی (زەمینناسی).

**Cretan** (krē′t'n), *adj.* تایبەتی بە دوورگەی " کریت " لە یۆنان و خەڵکەکەی و کلتوورەکەی.

*n.* دانیشتوویەکی دوورگەی " کریت " ؛ کریتی.

**cretin** (krē′tin), *n.* (١) کەسێك کە نەخۆشییەکی زگماکی هەبێت کە بریتییە لە کارنەکردنی لووی دەرەقی کە دەبێتە هۆی گەشەنەکردنی مێشك و لەش. (٢) کەسێکی کەر یا بێ مێشك.

**cretinism** (krē′tin-iz'm, krē′t'n-iz'm), *n.* نەخۆشییەکی زگماکییە بریتییە لە کارنەکردنی لووی دەرەقی کە دەبێتە هۆی بێ مێشکی و گەشەنەکردنی لەش

**cretonne** (kri-ton′, krē′ton), *n.* کریتۆن: قوماشێکی لۆکە یا کەتانی ئەستووری نەخشەدارە بۆ پەردە بەکاردەهێنرێت.

**crevasse** (krə-vas′), *n.* (١) درزێکی قووڵ بەتایبەتی لە بەستەڵەك یا بەخچاڵێکی سرووشتیدا. (٢) کون یا کەلەبەرێك لە بەستەکی قەراغ ڕووبارو جۆگەدا

*v.t.* درز، کون، یا کەلەبەر تێکردن.

**crevice** (krev′is), *n.* درز؛ قلیش؛ کون؛ کەلەبەر.

-creviced *(adj.).*

**crew** (kroo), *n.* (١) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ؛ جەماوەر. (٢) دەستەی کارگەران؛ تاقمێك کرێکار کە پێکەوە کار بکەن: *( a road ~ )*. (٣) فڕۆکەوانان؛ دەستەی کارگەرانی ناو فڕۆکە یا کەشتی: *( an airplane ~ )* (٤) کەشتییەوانان؛ کەشتیوان و کارگەرانی سەر پاپۆڕێك جگە لە ئەفسەرەکان. (٥) دەستەی سەوڵ لێدەران کە لە هەشت کەس پێکدێت. (٦) وەرزش و ملەملێی سەوڵ لێدان لە زانکۆدا.

**crew cut,** کەللەشەك؛ سەرتاشینی سفر یا لەبندا.

**crewman** (kroo′mən), *n.* ئەندامی دەستەی کارگەران.

**crewel** (kroo′əl), *n.* ڕێسی باریکی خوری (نەقشکردن).

**crib** (krib), *n.* (١) ئاخوڕ. (٢) تەویلە؛ گەوڕ. (٣) ژوور یا کوختەیەکی بچووکی ئاقوڵ. (٤) بێشکە؛ لانك؛ لانکە. (٥) زەمیلە. (٦) چوارچێوەیەکی دار یا ئاسن. (٧) عەمبار (دانەوێڵە). (٨) [Colloq.]، (ا) دزییەکی بچووك. (ب) دزینی بیروباوەڕی خەڵك و بڵاوکردنەوەی بەناوی خۆوە. (٩) [Colloq.]، (ا) قۆپییەکردنی قوتابی (لەڕێی بەکارهێنانی پوختەی باسێك یا گۆڕینێکی دەقاودەقی هۆنراوەیەکی زمانی بێگانە لە تاقیکردنەوەدا). (ب) کاغەزی قۆپییەکردن. (١٠) وەرەقی فڕێدراو (قومار). (١١) [Slang]، قەحبەخانە.

*v.t.* (١) بەستنەوە؛ قەتیس کردن؛ خستنە بێشکە یا تەویلەوە. (٢) [Colloq.]، دزینی بیروباوەڕی خەڵك و بڵاوکردنەوەی بەناوی خۆوە. (٣) [Colloq.]، دزین. (٤) [Colloq.]، بۆڵەبۆڵ کردن.

*v.i.* [Colloq.], قۆپییەکردن (تاقیکردنەوە).

**cribbage** (krib′ij), *n.* جۆرێکە لە یاری کاغەز.

**cribriform** (krib′ri-fôrm′), *adj.* کون کوناوی (وەك بێژنگ)؛ کون کون.

**crick** (krik), *n.* ڕەقیتەی مل و پشت؛ ئازارێکی لەپڕی تیژ لە مل یا پشتدا.

*v.t.* ڕەقیتەپێکردن؛ ئازار پێ گەیاندنی ماسولکەی مل یا پشت.

**cricket** (krik′it), *n.* سیسرك.

**cricket** (krik′it), *n.* (١) یاری " کریکێت " : یارییەکە بەزۆری لە ئینگلتەرە باوە بە تۆپ و گەڵاکوتك دەکرێت. (٢) [Colloq.]، ڕەفتاری ئاسك و پەسەندو جوان؛ یاری کردن بەبێ گزی کردن؛ گیانی وەرزشی.

*v.i.* یاری " کریکێت " کردن.

**cricket** (krik′it), *n.* تەپلەکێکی نزمی بچووکە قاچی دەخرێتە سەر.

**cricketer** (krik′it-ēr), *n.* یاریکەری " کریکێت "

**cricoid** (krī′koid), *adj.* ئەڵقەیی؛ خڕ.

*n.* کرکراگەیەکی خڕە لە بەشی خوارەوەی قوڕگدا.

**cried** (krīd), *past tense and past participle of* cry.

**crier** (krī′ēr), *n.* (١) گرینۆك؛ کەسێکی گریاو. (٢) جاڕچی دادگا. (٣) جاڕچی ئاوشار. (٤) هاوارکەر (دەستگێڕ، چەرچی)؛ فرۆشیاری هاوارکەر.

**crime** (krīm), *n.* (١) تاوان؛ خوێنخۆری. (٢) گوناه.

**criminal** (krim′ə-n'l), *adj.* (١) تاوانی؛ تایبەتی بە تاوان و سزا: *( ~ law)* (٢) تاوانبار؛ گوناهبار؛ گوناهکار. (٣) خوێنخۆری؛ تاوانی: *( a ~ act)*.

*n.* کەسێکی تاوانبار، گوناهبار، یا خوێنخۆر.

**criminal conversation,** داوێن پیسی؛ زینا.

**criminality** (krim′ə-nal′ə-ti), *n.* (١) تاوانبارێتی؛ گوناهبارێتی. (٢) تاوانێك؛ گوناهێك.

-criminally *(adv.).*

**criminal law,** یاسای تاوان و سزادان.

**criminalize** (krim′ə-n'l-īz′), *v.t.* بە تاوان دانان و سزا بۆ بڕینەوە.

**criminate** (krim′ə-nāt′), *v.t.* (١) تاوانبارکردن؛ گومانبارکردن.

(٢) پیشاندانی بەڵگەی تاوانبارێتی. (٣) سەرزەنشت کردن.

-**crimination** *(n.)*; **criminatory** *(adj.)*.

**criminologist** (krim´ə-nol′ə-jist), ***n.*** تاوانو تاوانبارناس؛ زانای تاوانو تاوانباران.

**criminology** (krim´ə-nol′ə-ji), ***n.*** تاوانو تاوانبارناسی؛ زانستی تاوانو تاوانباران.

**crimp** (krimp), ***v.t.*** (١) قەدکردن (جل‌وبەرگ). (٢) لوول کردن (قژ).
(٣) لە قالب دان یا دەق پێگرتنی چەرم بەپێی پێویست.

***n.*** (١) (ا) قەدکردن (ب) تویێ؛ قەد. (٢) *(pl.)* ، قژی لوول کراو.

**put a crimp in,** [Slang], ڕێ لێگرتن؛ کۆسپ لەبەردەمدا دانان.

**crimp** (krimp), ***n.*** کەسێك کە خەڵك بە زۆرەملێ یا فێڵ‌وتەڵەکە دەگرێت بە سەرباز یا کەشتیوان.

***v.t.*** خەڵك گرتن بە سەرباز یا کەشتیوان بە زۆرەملێ یا فێڵ‌وتەڵەکە.

**crimple** (krim′p'l), ***v.t. & v.i.*** چرچ‌ولۆچ کردن؛ چرچ‌ولۆچ بوون؛ ژاکاندن؛ ژاکان.

**crimpy** (krimp′i), ***adj.*** لوول (قژ) *( ~ hair)* .

**crimson** (krim′z'n), ***n.*** ڕەنگی ئاڵ یا قرمزی.

***adj.*** (١) ئاڵ؛ قرمزی؛ سوور وەك خوێنی لووت. (٢) خویناوی.

***v.t. & v.i.*** ئاڵ کردن؛ ئاڵ بوون؛ سوورکردن؛ سووربوون.

**cringe** (krinj), ***v.i.*** (١) کرژبوون (لە ترس یا لە ئازاردا)؛ خۆکشانەوە (لە مەترسی یا ئازار). (٢) کلکەلەقێ بۆ کردن؛ مەرایی بۆ کردن؛ مل بۆ شۆڕکردن.

***n.*** مل شۆڕکردن؛ کلکەلەقێ کردن؛ مەرایی کردن.

**cringle** (kriŋ′g'l), ***n.*** ئەڵقەیەك یا قولفەیەك بە تەوەر یا ڕاگرەی کەشتی باوە (بۆ گوریس پیاکردن‌و بەستنی بایەوان).

**crinite** (krī′nīt), ***adj.*** تووکن

**crinkle** (kriŋ′k'l), ***v.i. & v.t.*** (١) چرچ‌ولوچ بوون؛ چرچ‌ولۆچ کردن؛ لوول بوون؛ لوول کردن. (٢) خشەخش هاتن (وەك دەنگی پەڕەی کاغەز کە گرمۆڵە دەکرێت‌و فڕێ دەدرێت).

***n.*** چرچ‌ولۆچی؛ لوونی؛ لۆچ؛ لوول.

**crinoid** (krī′noid, krin′oid), ***adj.*** (١) گوڵە زەمبەقی
(٢) تایبەتی بە گیاندارێکی ئاوی بچووکی بێ گازەرای لە گوڵ چوو.

***n.*** گیاندارێکی وەها

**crinoline** (krin′'l-in, krin′'l-ēn´), ***n.*** (١) قوماشێکی ئەستووری لۆکە یا کەتانە بۆ بەری جل‌وبەرگ بەکاردەهێنرێت. (٢) ژێرکراسێکە بۆ دەق پێگرتن‌و فش بوونەوەی کراس یا تەنوورە لەبەردەکرێت.
(٣) کراسێکی فش بووەوە لە ناوقەد بەرەوخوار.

**criosphinx** (krī′ə-fiŋks´), ***n.*** دەعبایەکی ئەفسانەیی‌یە لەشی مرۆڤ‌و سەری بەرانی هەیە.

**cripple** (krip′'l), ***n.*** کەسێك یا گیاندارێکی گۆج، گێڕ، شەل، ئیفلیج، پەککەوتە، دەستەپاچە، یا کەفتەکار.

***v.t.*** (١) شەل‌و گۆج کردن؛ کەفتەکارکردن؛ ئیفلیج کردن.
(٢) لەکارخستن؛ پەکخستن.

**crisis** (krī′sis), ***n.*** (١) خاڵی گۆڕان لە نەخۆشی‌یەکدا کە لەدوایەوە نەخۆشەکە یا بەرەو چاکبوونەوە دەڕوات یا بەرەو مردن. (٢) خاڵی گۆڕان لە بارێکی ژیاندا. (٣) تەنگوچەڵەمە؛ گیروگرفت؛ دژواری؛ تەنگانە.

**crisp** (krisp), ***adj.*** (١) ووشك‌وبرنگ؛ ووشك‌وقرچۆك؛ ووشك.
(٢) ڕوون‌و ووردو کورت‌و لە جێی خۆیدا (ووتە، لێکدانەوە): *(~ analysis)* .
(٣) بەجۆش *( ~ dialogue)* .
(٤) فێنك یا ئەختێك ساردو خۆش‌و ووریاکەرەوە: *( ~ air)* .
(٥) لوول (قژ): *( ~ hair)* . (٦) چرچ‌ولۆچاوی.
(٧) تورت‌و تازە (کاهوو): *( ~ lettuce)* .

***v.t. & v.i.*** (١) ووشك کردنەوە؛ ووشکبوونەوە.
(٢) لوول کردن؛ لوول بوون.

**crispate** (kris′pāt), ***adj.*** لوول؛ لوول کراو.

**crispated** (kris′pā-tid), ***adj.*** = crispate.

**crispation** (kris-pā′shən), ***n.*** (١) لوول؛ لوول بوون.
(٢) کرژبوونێکی کەمی ماسولکە یا پێست.

**crisper** (kris′pẽr), ***n.*** ئوتوی لوول کردنی قژی سەر.

**crispy** (kris′pi), ***adj.*** = crisp.

**crisscross** (kris′krôs´), ***n.*** (١) لێدانی چەپ‌و ڕاستی دوو هێڵ وەك ئەم نیشانەیە ( X ) (هەندێك جار خەڵکی نەخوێندەوار لەبری ئیمزا بەکاری دەهێنن). (٢) نەخشەی لێدانی چەند هێڵێکی چەپ‌و ڕاست.

***adj.*** لێدان؛ لێدراو؛ لێکدراو.

***v.t.*** هێڵێکی ڕاست‌و چەپ پیاهێنان

***v.i.*** بە شەفتول یا پێچەوانە بزووتن.

***adv.*** بە لێکدراوی (هێڵ)؛ بە شەفتول؛ بە خواری.

**crissum** (kris′əm), ***n.*** (١) ناوچەی دەوری کونی پیسایی باڵندە.
(٢) ئەو پەڕە ووردانەی دەوری کونی پیسایی باڵندە دادەپۆشن.

**cristate** (kris′tāt), ***adj.*** = crested.

**cristated** (kris′tā-tid), ***adj.*** = crested.

**criterion** (krī-têr′i-ən), ***n.*** پێوەر؛ کێش؛ ئەندازە.

**critic** (krit′ik), ***n.*** (١) هەڵسەنگێنەری پەرتووك‌و فیلمی سینەمایی‌و شانۆگەری‌و هونەر (بەتایبەتی کەسێك کە هەڵسەنگاندنەکەی لە ڕۆژنامە یا پەرتووکدا بڵاوبکاتەوەو ئەمە پیشەی بێت‌و هەر بەمەیش گوزەران بکات)؛ ڕەخنەگر. (٢) کەسێکی بە ڕەخنە؛ ڕەخنەگر.

**critical** (krit′i-k'l), ***adj.*** (١) بە ڕەخنە؛ ڕەخنەگر؛ ڕەخنەبازانە:
*( He is very ~ of you.)*
(٢) تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی وورد:
*( a sound ~ estimate of the problem)*
(٣) تایبەتی بە هەڵسەنگاندن‌و هەڵسەنگێنەرەکان.
(٤) پەرێشان؛ پڕ لە مەترسی؛ ترسناك؛ شلۆق:
*( a ~ situation in internation relations)*
(٥) گرنگ؛ زۆر بە بایەخ: *( His support is ~ .)* .
(٦) گۆشە شلۆق (بیرکاری)؛ گۆشە مۆڵەکە.

**critical angle,** گۆشە شلۆق (زانستی بینایی‌و فڕین).

**critical point,** خاڵی شلۆق.

**critical state,** باری شلۆق؛ باری ناسك.

**criticaster** (krit′ik-as´tẽr), ***n.*** هەڵسەنگێنەرێکی قەڵب؛ شەن‌وکەوکەرێکی لێنەهاتوو.

**criticise** (krit′ə-sīz´), ***v.i. & v.t.*** = criticize.

**criticism** (krit′ə-siz'm), ***n.*** (١) هەڵسەنگاندن (وێژە، پەخشان، هونەر، فیلم)؛ پیشەو هونەری هەڵسەنگاندن.
(٢) هونەرو زانست‌و ڕێبازی هەڵسەنگاندن.
(٣) ڕەخنە؛ ڕەخنەگرتن؛ ڕەخنەکاری.

**critique** (kri-tēk′), ***n.*** (١) ووتارێکی هەڵسەنگێنەر یا شەن‌وکەوکەر (وێژە، پەخشان، هونەر)؛ ووتاری هەڵسەنگاندن یا شەن‌وکەوکردن.
(٢) هەڵسەنگاندن؛ شەن‌وکەوکردن.

**critter, crittur** (krit′ẽr), ***n.*** [Dial.], گیاندار، بەتایبەتی:
(ا) گیاندارێکی ماڵی (وەك مانگا، پارێن، یا ئاژەڵی تر).
(ب) دەعبا (گوورگ، وورچ... هتد).
(ج) ئادەمیزاد (لەڕووی گاڵتەپێکردن یا پێکەنینەوە).

**the critter,** خواردنەوەی سەرخۆشکەر (لەڕووی گاڵتەوە).

**croak** (krōk), ***v.i.*** (١) خوێندن (بۆق، قەلەڕەشکە)؛ واقەواق کردن؛ قریوە.
(٢) (ا) بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵاکردن؛ قرەهاتن. (ب) ڕەش بینین؛ قڕاندن.
(٣) [Slang]، مردن.

***v.t.*** (١) خوێندن (بۆق، قەلەڕەشکە)؛ قرەقرکردن؛ ووتن بە دەنگی گڕ.
(٢) [Slang]، کوشتن.

***n.*** خوێندنی بۆق یا قەلەڕەش؛ قرەی بۆق؛ قرەقر.

-**croakily** *(adv.)*; **croaky** *(adj.)*.

**croaker** (krōk′ẽr), ***n.*** (١) گیاندارێك کە وەك بۆق یا قەلەڕەش

بخوێنێت. (٢) جۆرە ماسی‌یەکە مرخەمرخ دەکات.
(٢) کەسێکی ڕەشبین؛ کەسێك کە هەمیشە بۆ شت بقرێنێت.

**Croat** (krō'at, krō'ət), *n.* = **Croatian.**

**Croatia** (krō-ā'shə), *n.* کرواتیا.

**Croatian** (krō-ā'shən), *adj.* کرواتی: تایبەتی بە وڵاتی کرواتیاو نەتەوەو زمان‌و کلتوورەکەی.
*n.* (١) کەسێکی کرواتی. (٢) زمانی کرواتی.

**crochet** (krō-shā'), *n.* چنین؛ جۆرە چنینێکە کە بە شیشی سەرچەماوە دەکرێت.
*v.i.* چنین بەم جۆرە شیشە

**crock** (krok), *n.* (١) مەرکانە؛ کووپە؛ گۆزە. (٢) سووالەت.

**crock** (krok), *n.* [British Dial.], (١) سووتووی ڕەش.
(٢) جۆرە خۆمێکە کە زوو لە جل‌وبەرگ دەبێتەوە.
*v.t.* [Dial.], پیس کردن (بە سوتووی ڕەش یا شتی پیس).

**crock** (krok), *n.* [British], کەسێکی کەفتەکار یا پەککەوتە.
*v.i.* [British Slang], نەخۆش کەوتن؛ پەککەوتن؛ کەفتەکاربوون.

**crocked** (krokt), *adj.* [Slang], سەرخۆش.

**crockery** (krok'ẽr-i), *n.* دەفری گڵین (گۆزە، دیزە، مەرکانە، کووپە، قاپ... هتد).

**crocket** (krok'it), *n.* نەخش‌و نیگارێکە لە شێوەی گەڵاو گوڵی کەوانەییدا لە خانووسازیدا بەکاردێت.

**crocodile** (krok'ə-dīl'), *n.* تیمساح: گیاندارێکی خشۆکە.

**crocodile tears,** فرمێسکی تیمساح؛ فرمێسکی درۆزنە، واتە غەمباری ڕووالەت‌و درۆ (ئەمە لە بیروباوەڕێکی کۆنەوە هاتووە کە گوایە تیمساح فرمێسك بۆ نێچیرەکەی دەرێژێت لەکاتێکدا دەیخوات).

**crocodilian** (krok'ə-dil'i-ən), *n.* تیمساح‌و گیانداری خشۆکی تری هەمان جۆر.
*adj.* (١) نەهەنگی. (٢) تایبەتی بە جۆری نەهەنگ‌و گیانداری تری لەم توخمە.

**crocus** (krō'kəs), *n.* (١) سۆسەن (گوڵ. ڕووەك)؛ چەند جۆرە ڕووەکێکە لە بابەتی سۆسەن گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێت. (٢) زەعفەران (ڕەنگ)؛ زەردێکی پرتەقاڵی. (٣) جۆرە بۆیەیەکی بریقەدارە.

**croft** (krôft), *n.* [British & Scottish], (١) کێڵگەیەکی بچووکی پەرژین کراو. (٢) کێڵگەیەکی بچووکی بەکرێدراو؛ زەوی.

**crofter** (krôf'tẽr), *n.* [British & Scottish], کشتیاری کێڵگەی بەکرێگر؛ وەرزێر؛ جووتیار (کە خاوەنی زەوی خۆی نەبێت).

**cromlech** (krom'lek), *n.* (١) گوومەزێکی زۆر کۆنە کە پێکهاتووە لە تاشەبەردێك‌و نراوەتە سەر چەند کێڵێك. (٢) گوومەزێکی زۆر کۆنە کە پێک- هاتووە لە چەند کێڵێك کە بە بازنەیی دانرابن بەچواردەوری گردۆڵەیەکدا.

**crone** (krōn), *n.* پیرێژنێکی پووکاوە؛ مەڕێکی پیر.

**crony** (krō'ni), *n.* برادەرێکی کۆنی گیانی بە گیانی؛ برادەرێکی نزیك (بەتایبەتی کە وەك دەسکەلا یا کلك بێت).

**crook** (krook), *n.* (١) قولاپ؛ شتێکی چەماوە. (٢) گۆچان. (٣) داردەستی قەشە. (٤) چەمینەوە؛ چەمانەوە. (٥) چەوتی؛ چەوتی‌یەك؛ پێچ. (٦) [Colloq.]، کەسێکی ساختەچی، سەرچەوت، فریوباز، یا دز.
*v.t. & v.i.* چەمانەوە؛ چەمینەوە؛ چەوتانەوە.

**crookback** (krook'bak'), *adj.* پشت کۆم؛ کۆم؛ کۆماوە.
-**crookbacked** *(adj.)*.

**crooked** (krook'id), *adj.* (١) خواروخێچ؛ چەوت؛ خوار؛ لار؛ کووپ. (٢) ساختەچی؛ سەرچەوت؛ فڕوفێڵاوی؛ فریوباز.

**crookneck** (krook'nek'), *n.* کوولەکەی مل باریك‌و خوار.

**croon** (krōōn), *v.i.* لاوانەوە؛ گۆرانی وتن لەبەرخۆوە بە دەنگێکی نزم.
*n.* لاوانەوە؛ گۆرانی وتنێك لەبەرخۆوە بە دەنگێکی نزم.
-**crooner** *(n.)*.

**crop** (krop), *n.* (١) چیکڵدانە (باڵندە). (٢) دانەوێڵە؛ دەغڵ‌ودان. (٣) بەرهەمی دانەوێڵەی وەرزێك یا زەوی‌وزارێك. (٤) دەستە، تاقم، کۆمەڵ، نەوە، یا بەرهەمی وەرزێك: *( a ~ of students)* . (٥) پێستەیەکی خۆشکراو بە یەك پارچەیی. (٦) دەسکی قامچی. (٧) قامچی‌یەکی قوڵفەدار. (٨) دوورینەوە، بەتایبەتی: (ا) کەللەشەك؛ سەرتاشینی سفر یا لەبندا. (ب) شێوازی ئەم جۆرە سەرتاشینە. (ج) گوێ بڕین، قرتاندن، یا کورتکردنەوە.
*v.t.* (١) سەر قرتاندن؛ قرتاندن؛ بڕینەوە: *( Sheep ~ grass.)* .
(٢) دوورینەوە؛ دروێنەکردن؛ چنینەوە.
(٣) چاندن؛ تۆودان؛ ناشتن.
(٤) سەرتاشین لەبندا؛ قژ کورتکردنەوە.
*v.i.* (١) دانەوێڵە هێنانە بەرهەم یا پێگەیاندن (زەوی‌وزار).
(٢) دانەوێڵە چاندن؛ ناشتن؛ تۆودان

**crop up (or out),** (١) هاتنەپێش؛ سەرهەڵدان (لەپڕو چاوەڕوان نەکراو): *( All sorts of unexpected difficulties cropped up.)*
(٢) دەرکەوتن؛ دیاربوون (لەسەر ڕووی زەوی وەك: بەرد، کانزا... هتد).

**crop-eared** (krôp'êrd'), *adj.* (١) گوێ بڕاو، قرتاو، یا کورتکراوە.
(٢) قژ لەبندا تاشراو بەجۆرێك کە گوێچکەکان دیاربن.

**cropper** (krop'ẽr), *n.* (١) بڕەرەوە (مرۆڤ، مەکینە)؛ دروێنەکەر یا تۆوچێنەر (مرۆڤ، مەکینە). (٢) دانەوێڵەی بە بەرهەم (بەبڕشت‌و بەبێ بڕشت) (٣) کشتیارێك کە زەوی‌وزاری کەسێکی تر دەگرێتە دەست‌و بەشێك لە بەرهەمی زەوی‌یەکە دەبات بۆ خۆی. (٤) [Colloq.]، (ا) کەوتن؛ کەوتنێکی زۆر خراپ (ب) ژێرکەوتن؛ فەوتان.

come a cropper, [Colloq.], (١) کەوتن؛ کەوتنەخوارەوە.
(٢) ژێرکەوتن؛ فەوتان: *( To come a cropper in an examination.)* .

**crop ratation,** چاندنی کێڵگە بە دانەوێڵەی جیاواز وەرز لەدوای وەرز.

**croquet** (krō-kā'), *n.* کرۆکی: یاری‌یەکە بە مێکوت‌و تۆپی دارین دەکرێت.

**croquette** (krō-ket'), *n.* پارچەیەك گۆشتی کوتراو یا ماسی‌یە کە تێکەڵ دەکرێت لەگەڵ ووردەنان، سەوزە، یا برنجداو خڕ هەڵدەدرێت‌و لە ڕۆندا سوور دەکرێتەوە.

**croquignole** (krō'kə-nōl', krō'kin-yōl'), *n.* شێوازێکی قژ- لوول کردنە.

**crosier** (krō'zhẽr), *n.* گورز یا داردەستی سەرەك قەشە.

**cross** (krôs), *n.* (١) سێدارە؛ چواردارە. (٢) خاچ (نیشانەی مەسیح). (٣) پەیکەرێکە لە شێوەی خاچدا یا خاچێکی بەسەرەوە بێت لە چوارڕێیانێك یا لە سنوورێکدا. (٤) داردەستێك کە خاچێکی بەسەرەوەیەو لەبەردەمی سەرەك قەشەوە هەڵدەگیرێت (لەڕووی نیشانەی دەسەڵاتی ئایینی‌یەوە). (٥) خاچ پەرستی؛ ئایینی خاچ پەرستی. (٦) مەینەتی؛ چەرمەسەری؛ ناخۆشی. (٧) ئەم نیشانەیە ( X ) . (٨) درووشمێك لە شێوەی خاچدا (نیشانەی سوار- چاکی یا مەدالیای تایبەتی). (٩) جووت کردن یا جووت بوونی دوو توخمی جیاواز. (١٠) ئەنجامی ئەم جووت بوونە؛ دووڕەگ. (١١) [-C]، (ا) کۆنەستێرەی باکوور. (ب) کۆنەستێرەی باشوور.
*v.t.* (١) نیشانەی خاچ کردن؛ نیشانەی خاچ لەخۆدان.
(٢) پەنجەی شایەتمان‌و پەنجە گەورە چەپ‌و ڕاست لەیەکتردان بۆ بەخت باشی (ئەفسانە): *( C~ your fingers.)* .
(٣) یەکتربڕینی دوو شەقام یا کۆڵان.
(٤) هێڵ پێداهێنان؛ ڕەشکردنەوە؛ سڕینەوە (بە هێڵ پێداهێنان).
(٥) پەڕینەوە: *( He ~ed the street.)* .
(٦) پێدا تێپەڕین.
(٧) بڕین؛ بەسەردا ڕۆیشتن: *( The bridge ~es a river.)* .
(٨) پێ گەیشتن؛ هاتنەڕێ؛ تووش بوون؛ بەیەکگەیشتن.
(٩) بەرەو ڕوو وەستان؛ دژ وەستان: *( No one likes to be ~ed.)* .
(١٠) جووت کردنی دوو توخم (گیاندار، ڕووەك).
*v.i.* (١) یەکتربڕین (دوو شەقام یا کۆڵان).
(٢) بڕین؛ درێژبوونەوە لەمبەر بۆ ئەوبەر.
(٣) تووش بوون؛ بەیەکگەیشتن؛ هاتنەڕێ؛ پێ گەیشتن.

(٤) جووت بوونی دوو توخم (گیاندار، ڕووەك).

*adj.* (١) برەر؛ پێدا تێپەڕ. (٢) دژ؛ پێچەوانە. (٣) تووڕە؛ تەنگەچیکڵانە؛ زوێر.
(٤) دووڕەگ (گیاندار، ڕووەك).

**cross off (or out),** هێڵ پێداهێنان، واتە سڕینەوە یا کوژانەوە.

**cross oneself,** بە دەست یا هێما نیشانەی خاچ لەخۆدان.

**cross one's fingers,** پەنجەی شایەتمان و پەنجە گەورە چەپ و ڕاست لەیەکدان (بۆ بەخت باشی).

**cross one's heart,** نیشانەی خاچ لە دڵی خۆ دان بە دەست یا هێما (نیشانەی ڕاستی وتنە).

**cross one's mind,** بە مێشکدا هاتن؛ بە خەیاڵدا هاتن.

**cross one's path,** تووش بوون (لەسەر ڕێگە)؛ بەیەکگەیشتن؛ هاتنەڕێ.

**take the cross,** خەبات کردن (بۆ بوون بە خاچ پەرست یا بیروباوەڕو ڕێبازێکی تر).

**the Cross,** (١) خاچی لەسەر هەڵواسینی مەسیح.
(٢) مەینەتی و تاڵاوچەشتن و مردنی مەسیح.
(٣) ئاینی خاچ پەرستی؛ خاچ پەرستان؛ جیهانی خاچ پەرستی.

**cross-** (krôs), پێشگرێکە بە هەموو ماناکانی وشەی " cross " ی پێشوو بەکاردەهێنرێت.

**crossbar** (krôs′bär′), *n.* شیشێکی لابەلا کە ڕایەڵ دەکرێت بەسەر دوو کۆڵەکە یا سنگی ستوونییەوە بۆ وەرزش کردن یا شوێن نیشانەکردن.
*v.t.* دانانی ئەم جۆرە شیش یا چوارچێوەیە.

**crossbeam** (krôs′bēm′), *n.* نیرگە؛ دەستەك.

**crossbill** (krôs′bil′), *n.* باڵندەیەکی بچووکە لە جۆری فیسقە.

**crossbones** (krôs′bōnz′), *n.* دوو ئێسقانی بە چەپ و ڕاست دانراو لەژێر کاسەی سەرێکدا وەك نیشانەی مەترسی یا مردن لەسەر ئاڵای چەتەی دەریا یا شووشەی ژەهراوی دەبینرێت.

**crossbow** (krôs′bō′), *n.* تیروکەوان؛ چەکێکی جەنگی کۆنە.

**crossbred** (krôs′bred′), *adj.* دووڕەگ.
*n.* گیاندار یا ڕووەکێکی دووڕەگ؛ دووڕەگ.

**crossbreed** (krôs′brēd′), *v.t.* جووت کردن یا لەیەك چاکردنی دوو توخم (گیاندار، ڕووەك).
*v.i.* جووت بوونی دوو توخم.
*n.* دووڕەگ؛ مرۆڤ، گیاندار، یا ڕووەکێکی دووڕەگ.

**cross-country** (krôs′kun′tri), *adj.* (١) بە دەشتودەر نەك بە ڕێگەدا (ڕۆیشتن، پێشبڕکێ، لێخوڕین): *(a ~ race)*.
(٢) لەم پەڕی وڵاتەوە بۆ ئەوپەڕ؛ لە سەرانسەری وڵاتدا.

**crosscut** (krôs′kut′), *v.t. & v.i.* لە باری پانی و لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕ بڕین یا بڕینەوە
*adj.* (١) بۆ بڕینەوە لە باری پانی دروستکراوە (مشار): *(a ~ saw)*.
(٢) لە باری پانی بڕاوە، واتە بەپێچەوانەی ئەمار یا ڕەگی ناو تەختە و دارەکە.
*n.* (١) بڕینەوەیەك یا بڕینێك لە باری پانی؛ ڕێبازێکی باری پانی. (٢) قەدبڕ.

**crosse** (krôs), *n.* دار یا ڕاکێتی یاری " لەکرۆس " کە بە تۆپ دەکرێت.

**cross-examination** (krôs′ig-zam′ə-nā′shən), *n.* (١) - پرسیارلێکردنێکی وردو توندوتیژو دوورودرێژ (بەتایبەتی هی ناحەزانە).
(٢) پرسیارلێکردنی وردو توندوتیژی شایەتی بەرامبەر لە دادگادا بۆ بەدرۆخستنەوەی شایەتەکە.

**cross-examine** (krôs′ig-zam′in), *v.t.* (١) پرسیارلێکردن بە وردی و توندوتیژی و دوورودرێژی (بەتایبەتی هی ناحەزانە).
(٢) پرسیارلێکردنی شایەتی بەرامبەر لە دادگادا بە وردی و توندوتیژی و دوورودرێژی بۆ بەدرۆخستنەوەی شایەتەکە

**cross-eye** (krôs′ī′), *n.* خێلی؛ چاو چەپ وڕاستی.

**cross-eyed** (krôs′īd′), *adj.* خێل؛ چاو چەپ وڕاست.

**cross-fertilization** (krôs′fūr′t'l-ə-zā′shən), *n.* جووت کردن یا لەیەك چاکردنی دوو توخم یا زیاتر (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).

**cross-fertilize** (krôs′fūr′t'l-īz′), *v.t.* جووت کردن یا لەیەك- چاکردنی دوو توخم یا زیاتر (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).

**cross fire,** (١) ئاگرباران؛ گوللەی یەکتربڕ؛ تەقەکردن لە هەمان نیشان لە دوو شوێن یا زیاترەوە. (٢) یەککگرتنەوەی چەند شتێك لە هەمان شوێندا.

**cross-grained** (krôs′grānd′), *adj.* (١) ئەمار ناڕێك و چەپ و- ڕاست و بەیەکداچوو (دار، تەختە). (٢) تووڕەوتڕۆ؛ تەنگەجیکڵانە؛ سەرسەخت.

**crosshead** (krôs′hed′), *n.* (١) شیشی گەیەنەر (مەکینە).
(٢) سەردێڕی بەندێك یا بەشێکی نووسراوێك (وتار، ڕۆژنامە، گۆڤار، پەرتووك).

**crossing** (krôs′iŋ), *n.* (١) پەڕینەوە؛ بڕین.
(٢) شوێنی پەڕینەوە (شەقام، ڕووبار)؛ بوار.
(٣) چوارڕێیان؛ دووڕیان؛ شوێنی یەکتربڕینی دوو شت.
(٤) جووت کردن یا لەیەك چاکردنی دوو توخم (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك)
(٥) شوێنی یەکتربڕینی هەر چوار لای زەمینەی کڵێسەیەك کە لە شێوەی خاچدا دروستکرابێت.

**cross-legged** (krôs′leg′id, krôs′legd′), *adj.* چوارمەشقی (دانیشتن)؛ قاچ لەسەر قاچ (دانیشتنی سەر کورسی).

**crosslet** (krôs′lit), *n.* خاچێکی بچووك.

**crossopterygian** (kro-sop′tə-rij′i-ən), *n.* جۆرە ماسییەکی دوابڕاو یا بنەبڕبووە کە بە باپیری گیاندارە بڕبڕەدارە ووشکانییەکان دادەنرێت.

**crossover** (krôs′ō′vẽr), *n.* (١) شوێنی پەڕینەوە (شەقام، ڕووبار)؛ بوار. (٢) هێڵێکی کورتی شەمەندەفەر کە بەهۆیەوە شەمەندەفەر لە هێڵێکی سەرەکییەوە دەگوێزرێتەوە بۆ هێڵێکی سەرەکی تر.
(٣) گۆڕینەوەی تایبەخۆی زگماکی لەنێوان کرۆمۆسۆمی هاوسرووشتدا.

**crosspatch** (krôs′pach′), *n.* [Colloq.], کەسێکی تووڕەوتڕۆی تەنگەجیکڵانەی بەسکاڵا.

**crosspiece** (krôs′pēs′), *n.* پارچە دار یا ئاسنێکە کە وەك دەستەك لەسەر دوو پایە، دیرەك، یا سنگ دانرابێت.

**cross-pollinate** (krôs′pol′ə-nāt′), *v.t. & v.i.* لەیەك چاکردن یا جووت بوونی ڕووەك بەهۆی با، مێش ومەگەز، یا مرۆڤ خۆیەوە.

**cross-pollination** (krôs′pol′ə-nā′shən), *n.* لەیەك چاکردن یا جووت کردنی ڕووەك بەهۆی مێش ومەگەز، با، یا مرۆڤ خۆیەوە.

**cross-purpose** (krôs′pūr′pəs), *n.* (١) مەبەستی دژ یا پێچەوانە.
(٢) (*pl.*)، یاری ووشەبازی و پرسیارو وەڵام.

**be at cross-purposes,** لە مەبەستی یەکتر نەگەیشتن؛ کارکردن، ووتوویژ کردن، یا نەخشەدانانی دوو کەس یا کۆمەڵ دژی یەکتر نەك بەدەسەنقەست، بەڵکو بەهۆی تێنەگەیشتن لە مەبەست و بیروباوەڕی یەکتری.

**cross-question** (krôs′kwes′chən), *v.t.* = **cross-examine.**
*n.* پرسیارێکە کە دەکرێت لەکاتی پرسیارو وەڵامی توندوتیژدا.

**cross-refer** (krôs′ri-fūr′), *v.t.* سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر لە بەشێکی پەرتووکێکەوە بۆ بەشێکی تری یا بۆ پەرتووکێکی تر بۆ زانیاری زیاتر.

**cross reference,** سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر لە بەشێکی پەرتووکێکەوە بۆ بەشێکی تری بۆ زانیاری زیاتر.

**crossroad** (krôs′rōd′), *n.* (١) ڕێگەیەك کە ڕێگەیەکی تر دەبڕێت.
(٢) شوێنی لێکدان یا بەیەکگەیشتنی دوو ڕێگە.
(٣) (*pl.*)، (ا) چوارڕێیان؛ دووڕیان.
(ب) شوێنی بەیەکگەیشتن و تێکەڵاوبوونی دوو کلتوور یا زیاتر.
(ج) قۆناغی گرنگ و هەڵبژاردنی ڕێبازی ژیان.

**at the crossroads,** کاتی ڕێبازی تازە گرتن و هەڵوێست گۆڕین.

**cross section,** (١) بڕینی شتێك لە باری پانی. (٢) بڕگە.
(٣) نموونە؛ نموونەیەکی هەمەچەشنە یا هەمەلایەن.

**cross-stitch** (krôs′stich′), *n.* تەقەڵێکە کە لە لێکدانی دوو تەقەڵی چەپ و ڕاست پێکهاتبێت لە شێوەی ( X ) دا.

**cross street,** (١) شەقامێکە کە لە شەقامێکی تر دەدات.
(٢) شەقامێکی بچووکە کە دوو شەقامی سەرەکی بەیەك دەگەیەنێت.

**cross talk,** بەیەکداچوونی دوو ئێستگەی ڕادیۆ، تەلەفزیۆن یا هێڵی تەلەفۆن.

**cross tie,** دەستەك (بەتايبەتى هى هێڵى شەمەندەفەر).
**crosstrees** (krôs′trēz′), *n.pl.* دوو دارى لابەلا بەسەر تەوەرەى كەشتى باوە
**crosswalk** (krôs′wôk′), *n.* شوێنى پەڕينەوەى پيادە بە شەقامێكدا.
**crossway** (krôs′wā′), *n.* = **crossroad.**
**crossways** (krôs′wāz′), *adv.* = **crosswise.**
**cross wind,** بايەكە كە بە لابەلاى ڕێبازى مرۆڤ، فڕۆكە، يا پاپۆڕدا هەڵدەكات.
**crosswise** (krôs′wīz′), *adv.* (١) بە لابەلايى؛ بە چەپ‌و ڕاستدا. (٢) بەپێچەوانە؛ بە دژى.
**crotch** (kroch), *n.* (١) ناوپەلى دارێكى دووپەل؛ گۆشەى بەيەككەيشتنى دوو پەل: *( She was sitting in the ~ of a tree.)*. (٢) ناوگەڵ؛ ناولنگ.
**-crotched** *(adj.).*
**crotchet** (kroch′it), *n.* (١) قولاپێكى بچووك. (٢) شتێكى وەك قولاپ. (٣) هەوەس يا ئارەزووێكى نابەجێ‌و سەرسەختى حولحوليانە. (٤) ئاوازێكى كورت (مۆسيقا).
**crotchety** (kroch′ə-ti), *adj.* حولحولى‌و سەرسەخت؛ تەنگەجيكلانە.
**croton** (krō′t′n), *n.* جۆرە ڕووەك يا دارێكە دەرمانى لێ دەردەهێنرێت.
**crouch** (krouch), *v.i.* (١) خۆمەلاسدان؛ خۆمتكردن؛ خۆماتدان. (٢) كڕنووش بۆ بردن؛ كڕنووش بۆ كردن.
*v.t.* كڕنووش بۆ بردن؛ كڕنووش بۆ كردن.
*n.* خۆمەلاسدان؛ خۆماتدان.
**croup** (krōōp), *n.* نەخۆشى وەناق.
**-croupous** *(adj.)*; **croupy** *(adj.).*
**croup** (krōōp), *n.* كەفەڵى ئەسپ‌و ماين.
**croupier** (krōō′pi-ēr), *n.* سەرەوكاربكەرى مێزى قومار: پارەى سەر مێزى قومارەكە كۆدەكاتەوەو بەشى براوەكان دەدات.
**crouton** (krōō-ton′, krōō′ton), *n.* پارچەيەك نانى ووشكى برژاوى بچووكە كە دەكرێتە ناو شۆربا يا زەلاتەوە.
**crow** (krō), *n.* (١) قەلەڕەش؛ قاژوو. (٢) [C-] ، ناوى كۆنەستێرەيەكە. (٣) نوێڵ
  **as the crow flies,** ڕاست؛ ڕێك؛ بە ڕێكى؛ بە هێڵێكى ڕێك‌و ڕەوان.
  **eat crow,** [Colloq.], پێ لە هەڵەى خۆ نان‌و تەريق بوونەوە.
**crow** (krō), *v.i.* (١) خوێندنى كەڵەشێر؛ قووقاندن؛ قووقەكردن. (٢) هاواركردنى خۆشى لەئەنجامى زاڵبوون يا سەركەوتندا. (٣) شانازى كردن؛ خۆفشكردنەوە: *( Stop ~ing over your victory.)*. (٤) زريقەكردنى خۆشى (منداڵ).
*n.* (١) خوێندنى كەڵەشێر؛ قووقە. (٢) زريقەى خۆشى (منداڵ).
**crowbar** (krō′bär′), *n.* نوێڵ.
**crowberry** (krō′ber′i, krō′bēr-i), *n.* جۆرە تووتڕكێكە
**crowd** (kroud), *v.i.* پاڵەپەستۆكردن؛ قەرەباڵغى كردن.
*v.t.* (١) پاڵەپەستۆكردن؛ قەرەباڵغى كردن؛ تێكچڕان. (٢) [Colloq.]، تەنگەتاوكردن؛ زۆر بۆ هێنان؛ هەڵپێچان (قەرزدانەوە). (٣) ڕێ لە بەرامبەر گرتن بۆ دەست نەكەوتنى تۆپ (يارى باسكە).
*n.* (١) كۆمەڵێكى گەورە (مرۆڤ، شت). (٢) جەماوەر؛ گەل؛ خەڵك؛ قەرەباڵغى. (٢) [Colloq.]، تاقم؛ دەستە.
**crowd** (kroud), *n.* ئامێرێكى مۆسيقايى كۆنە لە كەمانچە دەچێت.
**crowded** (kroud′id), *adj.* قەرەباڵغ؛ پڕ؛ جەنجاڵ.
**crowfoot** (krō′foot′), *n.* (١) ڕووەكێكە گەڵاكەى لە قاچى قەلەڕەشكە دەچێت. (٢) جەمسەرێكى زنكى پاترى. (٣) ئامێرێكى بزماراوىيە لەسەر زەوى دادەنرێت بۆ وەستاندنى ئەسپ سوارى دوژمن (٤) پەتى هەڵواسينى چەترى بەر دەرگاو پەنجەرە.
**crown** (kroun), *n.* (١) چەپكە گوڵى سەر ڕازاندنەوە (نيشانەى پاداشت‌و خەڵات‌و سەركەوتنە). (٢) پاداشت؛ خەڵات. (٣) كڵاوى زێڕينى شاهانە؛ تاج. (٤) دەسەڵاتى شاهانە. (٥) شا؛ پاشا. (٦) شتێكى جوان‌و ڕازێنەرەوە. (٧) (أ) دراوێكى ئينگليزىيە. (ب) هەرچ دراوێك كە وێنەى تاجى لەسەر هەڵكەنرابێت. (٨) تەوقەسەر. (٩) تەوقەسەرى كڵاو يا شەپقە. (١٠) كڵاوەى هەرچ شتێك؛ لووتكەى شاخ. (١١) ئەوپەڕى بەرزى؛ پۆپ. (١٢) (أ) ئەو بەشەى ددان كە لە پووكەوە سەرى دەرهێناوە؛ سەرى ددان. (ب) كڵاوەى دەستكردى ددان (لە زێڕ يا داڕشتە). (١٣) (أ) شوێنى بەيەككەيشتنى لاسك يا قەدو ڕەگى ڕووەكێك. (ب) لق‌وپۆپى دار؛ كڵاوەى گوڵ.
*v.t.* (١) كڵاوى زێڕين كردنەسەر؛ تاج خستنەسەر سەر. (٢) كردن بە پاشا؛ خستنەسەر تەختى پاشايى. (٣) خەڵات كردن. (٤) كڵاوە بۆ ددان دروستكردن. (٥) بەسەر يا پۆپەوە بوون: *( The hill is ~ed with a wood.)*. (٦) تەواو جوان كردن. (٧) [Slang]، لە تەوقەسەردان. (٨) كردن بە پاشا (يارى دامە).
  **the Crown,** (١) دەسەڵاتى پاشا. (٢) شا؛ پاشا.
**crown canopy,** كەپرى لق‌وپۆپى دار لە دارستانێكدا.
**crown colony,** وڵاتێكى تەواو ژێردەستەى تاجى ئينگلتەرە.
**crown land,** زەوى‌وزارى پاشا.
**crownpiece** (kroun′pēs′), *n.* (١) كڵاوەى شتێك. (٢) قايشى تەوقەسەرى لغاوى ئەسپ‌و ماين.
**crown prince,** جێنشينى پاشا؛ جێگرى پاشا.
**crown saw,** مشارى لوولەكى (بۆ كونى خڕ كردنە شت).
**crow's-foot** (krōz′foot′), *n.* (١) چرچ‌ولۆچى دەوروپشتى چاو. (٢) تەقەڵێكى سێ سووچە كە وەك نەقش دەدرێت لە تێكى دروومانێك. (٣) ڕووەكێكى گوڵ‌و گەڵا دڕكاوىيە. (٤) ئامێرێكى بزماراوىيە لەسەر زەوى دادەنرێت بۆ وەستاندنى ئەسپ سوارى دوژمن.
**crow's-nest** (krōz′nest′), *n.* (١) ڕووانگەيەكى بچووكى سەر پاپۆڕ. (٢) ڕووانگەى قەراغ دەريا يا شوێنى تر.
**croze** (krōz), *n.* درز يا كەندەكى بەرميلێك كە سەرەكەى تێ دەخرێت‌و دەچەسپێنرێت.
**crozier** (krō′zhēr), *n.* = **crosier.**
**crucial** (krōō′shəl), *adj.* (١) زۆر گرنگ: *( a ~ decision)*. (٢) سەخت؛ ناهەموار؛ گران؛ ناخۆش؛ دژوار. (٣) چەپ‌و ڕاست (توێكارى)؛ لە شێوەى خاچدا.
**cruciate** (krōō′shi-it, krōō′shi-āt′), *adj.* (١) گەڵاى خاچ شێوە (ڕووەكناسى). (٢) چەپ‌و ڕاست (باڵى باڵندە).
**crucible** (krōō′sə-b'l), *n.* (١) دەفرێكى كانزايى سەختە كە بەرگەى گەرماى زۆر بگرێت بەمەبەستى تواندنەوەى كانزاى تر تێيدا. (٢) بۆشايى بنى فڕنێك كە كانزاى تواوەى تێدا كۆدەبێتەوە. (٣) تاقيكردنەوەيەكى سەخت‌و دژوار.
**crucifer** (krōō′sə-fēr), *n.* (١) خاچ هەڵگر (لە نواندنى كڵێسەدا). (٢) هەرچ ڕووەكێك گوڵەكەى لە شێوەى خاچدا بێت.
**-cruciferous** *(adj.).*
**crucifix** (krōō′sə-fiks′), *n.* (١) خاچێك كە وێنەى عيساى بە هەڵواسراوى پێوەبێت. (٢) خاچ (وەك نيشانەيەكى ئاينى).
**crucifixion** (krōō′sə-fik′shən), *n.* (١) هەڵواسين؛ لەسێدارەدان. (٢) [C-]، هەڵواسينى مەسيح؛ بەسێدارەوەكردنى مەسيح يا نواندنى ئەم كارە لە پەيكەرو وێنەو نيگاردا.
**cruciform** (krōō′sə-fôrm′), *adj.* لە خاچ دەچێت.
**crucify** (krōō′sə-fī′), *v.t.* (١) هەڵواسين؛ لەسێدارەدان. (٢) بەزاندن، كوشتن، يا دابينكردنى ئارەزووى بەدى لەش. (٣) چەوساندنەوە؛ ئازاردان.
**crud** (krud, krood, krōōd), *v.t. & v.i.* [Dila.], مەيين؛ خۆگرتن.
**crud** (krud), *n.* (١) [Slang] ، پيسايى (بەتايبەتى كە قەتماغەى بەستبێت يا ووشك بووبێتەوە)؛ شتێكى پيس‌و بۆگەن.

(٢) کەسێکی پیس و بۆگەن. (٣) [Slang]، نەخۆشی پێست؛ گەڕی.
**-cruddy** *(adj.)*.
**crude** (krōōd), *adj.* (١) خاو؛ نەپاڵێوراو؛ پوختە نەکراو: *(~ oil)* .
(٢) نەگەییو؛ کاڵ و کرچ.
(٣) کەرتێ؛ کاڵ (مرۆڤ)؛ سادە: *(a ~ fellow)* .
(٤) ناپوختە (کار)؛ قەڵپ؛ خراپ: *(~ woodwork)* .
(٥) ڕووت؛ نەڕازاوە: *(~ reality)* .
**-crudely** *(adv.)*; **crudity** *(n.)*; **crudeness** *(n.)*.
**crude oil,** نەوتی خاو یا پوختە نەکراو.
**cruel** (krōō'əl), *adj.* دڵڕەق؛ بێ بەزەیی؛ ستەمکار.
**cruelty** (krōō'əl-ti), *n.* (١) دڵڕەقی؛ بێ بەزەییتی؛ ستەمکاری.
(٢) کردەوەیەکی دڵڕەقانە؛ کردەوە یا ڕووتەیەکی بێ بەزەییانە.
**cruet** (krōō'it), *n.* شووشەیەکی بچکۆلەی سەر مێزی نانخواردنە سرکە یا ڕۆنی زەڵاتەی تێ دەکرێت.
**cruise** (krōōz), *v.i.* (١) گەشتکردن بە بەلەم؛ گەڕان بۆ ڕابواردن بە بەلەم، کەشتی، ئۆتومبیل، یا فڕۆکە بەبێ نەخشەیەکی تایبەتی و جێیەکی مەبەست.
(٢) گەڕان *( A taxi ~s in search of passengers.)* .
(٣) ڕۆیشتن بە خێراییەک کە بگونجێت بۆ قۆناغی دوور:
*( The airplane ~d at 270 miles an hour.)*
*n.* گەشتی دەریایی؛ گەشت؛ گەڕانی کەیف و ڕابواردن.
**cruiser** (krōōz'ēr), *n.* (١) بەلەم، کەشتی، یا فڕۆکەی گەشت.
(٢) پاپۆڕێکی جەنگی خێرا کە بەئاسانی مناوەرەی پێ دەکرێت.
(٣) بەلەمێکی گەورە کە هەموو پێویستییەکی شەو تێدامانەوەی تێدابێت.
(هەروەها پێشی دەوترێت: " cabin cruiser ") .
(٤) ئۆتومبیلی پۆلیس. (هەروەها پێشی دەوترێت: " squad car ") .
**cruising speed,** خێرایی ئاسایی فڕۆکە.
**cruller** (krul'ēr), *n.* کێکی شیرین.
**crumb** (krum), *n.* (١) ووردەنان؛ کونێچکەنان؛ پەنچك: *( bread ~s )* .
(٢) نەخت؛ تۆزقاڵ: *( ~s of knowledge)* .
(٣) ناوەڕۆکە هەویراوییەکەی نان.
*v.t.* (١) ووردکردن؛ ووردوخاش کردن. (٢) توندکردنەوە بە ووردەنان.
(٣) [Colloq.]، پاکردنەوەی مێزی نانخواردن و لابردنی ووردەنان لەسەری.
*v.i.* ووردبوون؛ ووردوخاش بوون.
**crumble** (krum'b'l), *v.t.* ووردکردن؛ پارچەپارچەکردن.
*v.i.* ڕووخان؛ ووردبوون؛ ووردوخاش بوون؛ پروان؛ داڕزان.
**crumblings** (krum'b'l-iŋz'), *n.* پارچەی وورده؛ ووردەنان.
**crumbly** (krum'bli), *adj.* بەئاسانی وورد دەبێت؛ بەئاسانی پارچە پارچە دەبێت؛ قرچۆك.
**crummie, crummy** (krum'i, kroom'i), *n.* [Scot. & Bri.-Dial.], مانگای شاخ چەماوە.
**crummy** (krum'i), *adj. Also* **crumby**, [Slang], قەڵپ؛ خراپ؛ پیس؛ بۆگەن (کار، شوێن، مرۆڤ، خواردن، شت... هتد)؛ ناپەسەند.
**crump** (krump, kroomp), *v.t.* (١) کرۆشتن (بە ددان)؛ داکرماندن؛ خرمەخرم لێ هەڵسان. (٢) زرمە لێ هەڵسان؛ قرچە لێ هەڵسان.
*v.i.* زرمەهاتن؛ قرچەهاتن.
*n.* (١) دەنگی کرۆشتن؛ خرمەخرم. (٢) زرمە؛ قرچە.
**crumpet** (krum'pit), *n.* جۆرە کێکێکی خڕی تەنکە سوور دەکرێتەوە و بە کەرەوە دەخورێت.
**crumple** (krum'p'l), *v.t.* ژاکاندن و گرمۆڵەکردن؛ گرمۆڵەکردن؛ چرچ و لۆچ کردن.
*v.i.* (١) ژاکان؛ گرمۆڵەبوون؛ چرچ و لۆچ بوون.
(٢) [Colloq.]، ڕووخان؛ هەرەس هێنان.
*n.* چرچ و لۆچی؛ ژاکاوی.
**crunch** (krunch), *v.i. & v.t.* (١) داکرۆشتن (بە ددان)؛ داکرماندن؛ خرمەخرم لێ هەڵسان. (٢) هاڕین؛ هاڕە لێ هەڵساندن.
*n.* (١) داکرمان؛ داکرۆشتن؛ خرمەخرم.
(٢) دەنگی هاڕین؛ هاڕە.
**crunchy** (krun'chi), *adj.* خرمەخرمی دێت کە دەخورێت.
**crupper** (krup'ēr, kroop'ēr), *n.* (١) پاڵوو (زین، کورتان).
(٢) کەفەڵ یا سمتی ئەسپ و ماین.
**crural** (kroor'əl), *adj.* تایبەتی بە لاق یا لوولاق.
**crus** (krus), *n.* (١) لاق؛ لوولاق. (٢) هەرچ ئەندامێك کە لە لاق بچێت.
**crusade** (krōō-sād'), *n.* (١) [C-]، جەنگی خاچ پەرستان کە لە سەدانی یانزە و دوانزە و سیانزەدا گێڕایان دژی موسوڵمانەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. (٢) جەنگێکی ئاینی. (٣) خەبات (لەپێناو یا دژی بیروباوەڕێکدا).
*v.i.* خەبات کردن؛ تێکۆشان؛ هەوڵدانێکی بەتین.
**crusader** (krōō-sād'ēr), *n.* (١) خاچ پەرستێك کە بەشداری جەنگی خاچ پەرستەکان بووبێت (ووشەی پێشوو ببینە).
(٢) خەباتکەر؛ تێکۆشەر؛ ئالاهەڵگر.
**cruse** (krōōz, krōōs), *n.* [Archaic], دەفرێکی بچووك بۆ ئاو، ڕۆن، هەنگوین... هتد.
**crush** (krush), *v.t.* (١) ووردکردن؛ ووردوخاش کردن؛ پرواندن.
(٢) فلیقاندنەوە؛ پان و پلیش کردنەوە؛ قوپاندن؛ پلیشاندنەوە؛ گرمۆڵەکردن
(٣) شکاندن؛ بەزاندن: *( He ~ed his enemies.; a ~ing defeat)* .
(٤) گوشین؛ ووشین و ئاو یا خۆشاو لێ دەرهێنان (میوە).
*v.i.* (١) ووردبوون؛ ووردوخاش بوون. (٢) فلیقانەوە؛ پلیشانەوە؛ پەستانەوە.
*n.* (١) پەستنەوە؛ پەستاوتن؛ فلیقانەوە؛ ووردوخاش بوون.
(٢) جەماوەرێك کە ترنجابنە شوێنێکی بچووکەوە. (٣) خۆشاو
(٤) (ا) دڵ پێداچوون (بەتایبەتی کاتی)" حەزلێکردن" حەز:
*( She had a ~ on him.)*
(ب) کەسێکی دڵ پێداچوو.
**crust** (krust), *n.* (١) (ا) دیوی دەرەوە و ڕەقی نان، کولێرە، کێك... هتد.
(ب) نانی ڕەق بووەوە؛ نانەڕەقە (٢) بنکڕ.
(٣) توێژاڵ یا توێکی ڕەق (زەوی، بەفر)؛ قاوغ.
(٤) دیوی دەرەوەی زەوی (زەمیناسی).
(٥) کرێش؛ برینی ووشك بووەوە؛ قەتماغە.
(٦) خڵتەی ڕەق بووی شەراب لەناو شووشەدا.
(٧) [Slang]، چاوقایمی؛ بێ شەرمی؛ بێ حەیایی.
*v.t. & v.i.* (١) ڕەق بوون (توێك، توێژاڵ)؛ قەتماغە بەستن.
(٢) داپۆشین بە توێك یا قاوغێکی ڕەق؛ ڕەق کردنی دیوی دەرەوەی شتێك
**crustacean** (krus-tā'shən), *n.* گیاندارێکی ئاوی قاوغدار (قرژاڵ، کوللەی ئاو... هتد).
*adj.* تایبەتی بەم جۆرە گیاندارە.
**crustaceous** (krus-tā'shəs), *adj.* (١) قاوغدار؛ توێکداری ڕەق.
(٢) تایبەتی بە گیانداری ئاوی قاوغدار.
**crustal** (krus't'l), *adj.* توێك ڕەق (بەتایبەتی زەوی):
**crusted** (krus'tid), *adj.* (١) توێکداری ڕەق؛ بنکڕدار؛ ڕەق.
(٢) خڵتە ڕەق بوو (شەراب). (٣) کۆن.
**crusty** (krus'ti), *adj.* (١) ڕەق (نان، کێك)؛ توێکداری ڕەق.
(٢) توندوتیژو ڕەق (مرۆڤ).
**crutch** (kruch), *n.* (١) دارشەق؛ گۆچان (٢) پشتگیر؛ پاڵپشت.
(٣) ناولنگ؛ ناوگەڵ.
*v.t.* پشت گرتن؛ پشتگیری کردن؛ پاڵپشت کردن
**crux** (kruks), *n.* (١) خاچ. (٢) کێشە؛ گیروگرفتێکی سەرسووڕمێنەر.
(٣) ناوکرۆك؛ گرنگترین و سەرەکی ترین بەش یا خاڵی مەسەلەیەك.
(٤) [C-]، ناوی کۆنەستێرەیەکە.
**cry** (krī), *v.i.* (١) هاوارکردن؛ قیراندن؛ قیژاندن؛ ناڵاندن؛ بانگ کردن.
(٢) گریان؛ کرووزانەوە. (٣) وەڕین، لووراندن، یا هەر دەنگێکی تری گیاندار.
*v.t.* (١) پاڕانەوە. (٢) هاوارکردن. (٣) بانگ کردن؛ بانگدان؛ بانگ هەڵدان یا جاڕدان (بۆ شت فرۆشتن، کڕین، یا چاکردن).

*n.* (١) هاوار؛ قیژە؛ قیرە؛ نالە. (٢) گریان؛ کرووزانەوە.
(٣) بانگ؛ بانگ هەڵدان؛ بڵاوکەرەوە. (٤) پاڕانەوە؛ داوا؛ داوالێکردن.
(٥) قاو؛ واتەوات. (٦) ناڕەزایی گەل؛ هاواری گەل.
(٧) درووشم؛ بانگەواز؛ بانگی جەنگ.
(٨) وەڕە، لوورە، یا هەر دەنگێکی تری وەهای گیاندار.
(٩) وەڕینی سەگ لەکاتی ڕاودا. (١٠) گەلەسەگ.
**a far cry,** (١) ماوەیەکی دوور. (٢) زۆر جیاواز؛ شتێکی زۆر جیاواز.
**cry down,** لە پلە نزم کردنەوە؛ شکاندن؛ بە سووک سەیرکردن.
**cry for,** (١) بۆ گریان؛ داواکردن. (٢) ویستن؛ پێویست بوون.
**cry one's eyes (or heart) out,** بە کوڵ گریان؛ شیوەن کردن.
**cry oneself to sleep,** خۆ کردنە خەو بە گریانێکی زۆر.
**cry out,** (١) هاوارکردن؛ قیژاندن؛ ناڵاندن.
(٢) سکاڵاکردن؛ ناڕەزایی دەربڕین بە دەنگی بەرز.
**cry over spilled milk,** خەفەت بۆ شتی لەدەست چوو خواردن.
**cry up,** ستایش کردن؛ بە شان و باهودا هاتنەخوارەوە.
**cry wolf,** دەنگ بە هاوار بوون؛ بانگدانی مەترسی درۆ.
**in full cry,** چنگ لەسەر شان شوێن کەوتن (سەگی ڕاو).
**crybaby** (krī′bā′bi), *n.* (١) گرینۆک (منداڵ).
(٢) کەسێکی گرینۆک وەک منداڵ.
**crying** (krī′iŋ), *adj.* (١) هاوارکەر؛ قیرەقیرکەر؛ قیژەقیژکەر.
(٢) چارەسەری بە پەلەی پێویستە؛ هاوار دەکات بۆ سەرنج ڕاکێشان و چارەسەرکردن *(a ~ shame; a ~ need)*.
**cryo-** (krī′ō, krī′ə), پێشگرێکە بەمانای: سارد؛ تەزیو.
**cryogen** (krī′ə-jən), *n.* تەزێنەر؛ ساردکەر.
**cryogenics** (krī′ə-jen′iks), *n.pl.* زانستی پلەی گەرمی زۆر نزم یا بەستن وە کارکردنەسەری مادە.
**cryometer** (krī-om′ə-tēr), *n.* پێوەری پلەی گەرمی زۆر نزم.
**cryoscopy** (krī-os′kə-pi), *n.* زانستی دیاریکردنی پلەی بەستنی شلە.
**cryostat** (krī′ə-stat′), *n.* ئامێری پاراستنی پلەی گەرمی زۆر نزمی شتێك.
**cryotherapy** (krī′ō-ther′ə-pi), *n.* بەکارهێنانی تەزین یا تەزاندن بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی.
**crypt** (kript), *n.* (١) سەرداب یا ژێرزەمینی کڵێسەیەك کە گۆڕستانە.
(٢) بۆشاییەکی ناو لەش (وەك کیسی لوو یا شوێن بنجی تووك).
**cryptic** (krip′tik), *adj.* (١) نهێنی؛ پەنهانی.
(٢) شاراوە (مانا)؛ نادیار؛ لێڵ: *(a ~ remark)*.
(٣) تایبەتی بە خۆشاردنەوەی گیاندار لەڕێی ڕەنگ گۆڕینەوە.
**crypto-, crypt-** (krip′tō, krip′tə), پێشگرێکە بەمانای: نهێنی؛ شاراوە؛ نادیار؛ لێڵ.
**cryptogam** (krip′tə-gam′), *n.* ڕووەکێکی بێ گوڵ و تۆوە بەهۆی شانەی تایبەتییەوە زاووزێ دەکات وەك قەوزە.
-cryptogamic *(adj.)*; cryptogamous *(adj.)*.
**cryptogenic** (krip′tə-jen′ik), *adj.* سەرچاوەکەی شاراوەیە و نازانرێت (نەخۆشی).
**cryptogram** (krip′tə-gram′), *n.* نامە یا نووسراوێك کە بە شفرە نووسرابێت.
**cryptograph** (krip′tə-graf′, krip′tə-gräf′), *n.* (١) نامەی بە شفرە نووسراو. (٢) شفرە. (٣) (ا) ئامێری گۆڕینی نووسینی ئاسایی بۆ شفرە. (ب) ئامێری دەرکردن یا خوێندنەوەی شفرە.
**cryptography** (krip-tog′rə-fi), *n.* (١) هونەری نووسین و دۆزینەوەی شفرە. (٢) شفرە؛ جۆرە نووسینێکی نهێنی.
-cryptographer *(n.)*; cryptographist *(n.)*.
**cryptology** (krip-tol′ə-ji), *n.* (١) cryptography.
(٢) زمانی نهێنی.

**cryptonym** (krip′tə-nim′), *n.* ناوی نهێنی.
-cryptonymous *(adj.)*.
**crystal** (kris′t'l), *n.* (١) بلوور: کانزایەکی سپی ڕۆشنە وەك سەهۆڵ؛ کریستاڵ. (٢) پارچەیەك بلوور (بۆ جوانی و ڕازاندنەوە).
(٣) شووشەی زۆر ڕۆشن. (٤) شتێکی جوانی لە بلوور دروستکراو.
(٥) قەپاغی شووشەی سەر کاتژمێر. (٦) شتێکی ڕۆشن و سپی وەك بلوور.
*adj.* (١) بلووری؛ لە بلوور دروستکراو؛ تایبەتی بە بلوور.
(٢) وەك بلوور؛ ڕۆشن و دیار؛ ئاشکرا.
**crystal ball,** بلووری خڕی فاڵگرتنەوە.
**crystal gazing,** چاوبڕینە بلووری خڕو فاڵگرتنەوە.
**crystalliferous** (kris′t'l-if′ēr-əs), *adj.* بلووری تێدایە؛ بلووری لێ دەردەهێنرێت.
**crystalline** (kris′t'l-in, kris′t'l-īn′), *adj.* (١) بلووری؛ لە بلوور دروستکراو. (٢) بلووری؛ ڕۆشن؛ ڕوون؛ ئاشکرا؛ دیار.
(٣) سرووشت و پێکهاتنی وەك بلوورە.
**crystalline lens,** هاوێنەی چاو؛ گەردبینی چاو.
**crystallize** (kris′t'l-īz′), *v.t.* (١) وەك بلوور لێکردن.
(٢) شەکر تێهەڵسوون؛ ڕووکەش کردن بە شەکر: *(~d fruits)*.
(٣) دیاریکردن؛ شێوەی تایبەتی پێدان؛ ڕوونکردنەوە.
*v.i.* (١) وەك بلوور لێهاتن. (٢) شێوەی تایبەتی وەرگرتن؛ ڕوون بوونەوە؛ دەق گرتن (بیروباوەڕ): *(His vague ideas ~d into a definite plan.)*.
(٣) گەڕانەوە (هەنگوین)؛ بوون بە شەکر: *(Honey ~s in time.)*.
-crystallized *(adj.)*; crystallization *(n.)*.
**crystallo-** (kris′t'l-ō), پێشگرێکە بەمانای: بلوور.
**crystallography** (kris′t'l-og′rə-fi), *n.* زانستی شێوە و پێکهاتن و سرووشت و بابەت کردنی بلوور.
-crystallographical *(adj.)*; crystallographer *(n.)*.
**crystalloid** (kris′t'l-oid′), *adj.* بلووری؛ وەك بلوور وایە.
*n.* (١) مادەیەکی بلوورییە کە لە ئاودا دەتوێتەوە بە پەردەی لەشی مرۆڤ و گیاندار و ڕووەکدا دەڕوات. (٢) گەردی بلووریی زۆر بچووکی پرۆتین کە لە شانەی هەندێ ڕووەك و بەری ڕووەکدا هەیە بەتایبەتی لە تۆوی چەوردا.
**ctenoid** (tē′noid, ten′oid), *adj.* قەراغەکەی وەك شانە وایە (وەك پوولەکە و ددانی هەندێ ماسی).
**ctenophoran** (ti-nof′ə-rən), *n.* جۆرە ماسییەکە پەڕەی شانەیی هەیە بۆ مەلەکردن.
**ctenophore** (ten′ə-fôr′, tē′nə-fōr′), *n.* (١) جۆرە ماسییەکە پەڕەی شانەیی هەیە بۆ مەلەکردن. (٢) ئەم پەڕە شانەییانە.
**cub** (kub), *n.* (١) بەچکە (شێر، پڵنگ، ورچ، ڕێوی، ئەهەنگ... هتد).
(٢) لاوێکی نەشارەزای ناقۆڵا. (٣) نۆکار (بەتایبەتی ڕۆژنامەچی).
(٤) ئەندامێکی ڕێکخراوی دیدەوانی کوڕان لە تەمەنی (٨ – ١١) ساڵاندا.
**cubage** (kū′bij), *n.* = cubature.
**cubature** (kū′bə-chēr), *n.* (١) دیاریکردنی ناوەڕۆکی قەوارەیی.
(٢) ناوەڕۆکی قەوارەیی.
**cubby** (kub′i), *n.* ژوورێکی بچووك؛ خانە.
**cubbyhole** (kub′i-hōl′), *n.* (١) ژوورێکی بچووك؛ ژوورچکە.
(٢) خانەی دۆڵابێك؛ کەنجینە؛ تاق. (٣) شوێنێکی تەسك و بچووکی دەورگیراو.
**cube** (kūb), *n.* (١) شەش پاڵوو (ئەندازە). (٢) شتێکی شەش پاڵوویی (وەك زاری تاوڵە). (٣) ژمارەی سێجا (بیرکاری).
*v.t.* (١) سێجاکردن (بیرکاری). (٢) پێوانی ناوەڕۆك.
(٣) قاشکردن بە شێوەی شەش پاڵوو (پیاز، سەوزە).
(٤) بڕینی چوارگۆشەیی پارچە گۆشت بەئاستەم بۆ زوو کوڵاندنی.
**cubeb** (kū′beb), *n.* (١) بەری ڕووەکێکە لە بابەتی بەلووبیبەر بۆ دەرمان بەکاردەهێنرێت. (٢) جگەرەی بەری هاڕراوی ئەم ڕووەکە.
**cubic** (kū′bik), *adj.* (١) شەش پاڵوویی؛ شەش پاڵوو.
(٢) قەوارەیی؛ سێ دووری هەیە (درێژی و پانی و ئەستووری): *(a ~ foot)*.

(٣) سێجا (بیرکاری).
**cubical** (kū′bi-k′l), *adj.* شەش پالوویی (شێوە)؛ قەوارەیی.
**cubicle** (kū′bi-k′l), *n.* (١) ژووروچکەی نووستن؛ جێی نووستن لە ژووروچکەیەکدا. (٢) (ا) ژووروچکەی خوێندنەوە لە کتێبخانەدا.
(ب) ژووروچکە
**cubic measure,** پێوانەی قەوارەیی؛ پێوانی قەوارە.
**cubiform** (kū′bi-fôrm´), *adj.* شەش پالوو شێوە.
**cubism** (kūb′iz′m), *n.* ڕێبازێکی هونەریی (بەتایبەتی وێنەکێشی و پەیکەرتاشی) تازەی سەدەی بیستە بریتییە لە بەکارهێنانی شێوەی ئەندازەیی بەتایبەتی شەش پالوو لە هونەردا
**cubist** (kūb′ist), *n.* هونەرمەندی شەش پالووگەر. هونەرمەندێك کە لەسەر ئەم ڕێبازە هونەرییە بڕوات (ووشەی پێشوو ببینە)
**cubit** (kū′bit), *n.* بال. پێوەرێکی کۆنە درێژی (١٨-٢٠) گرێیە لە نووکی پەنجەی بەرزەلووتەوە تا ئانیشك.
**cuboid** (kū′boid), *n.* (١) شەش پالوویی.
(٢) تایبەتی بە ئێسقانێکی شەش پالوویی کە لە قولەپێدایە.
*n.* (١) شەش پالوویەکی لاکێشەیی.
(٢) ئێسقانێکی شەش پالوویی لەنێوان قولەپێ و ئاسمانەی پێدا.
**cub reporter,** ڕۆژنامەگەرێکی نۆکار؛ پەیامنێری نۆکار
**cucking stool,** کورسییەکە ژنی دەم شڕو بێ حەیا و بازرگانی ساختەچی و کەسانی تری وەهای تێ دەخرا بۆئەوەی جەماوەر گاڵتەیان پێ بکەن و هەندێ جاریش لە ئاویان هەڵکێشن.
**cuckold** (kuk′′ld), *n.* مێردی ژنێکی داوێن پیس؛ پیاوێکی ژن گایراو.
*v.t.* سەرشۆڕکردنی پیاوێك بە جووت بوون لەگەڵ ژنەکەیدا؛ گاینی ژنێك و شکاندنی مێردەکەی.
**cuckoldry** (kuk′′ld-ri), *n.* شکاندنی پیاوێك بە گاینی ژنەکەی؛ داوێن پیسی؛ زینا
**cuckoo** (kook′ōō), *n.* (١) پەپوو: باڵندەیەکە خوێندنەکەی وەك کونە- پەپوو وەهایەو هێلکە لە هێلانەی باڵندەی تردا دەکات و بەجێیان دەهێڵێت بۆ ئەو باڵندەیەی تر تاوەکو هەڵیان بهێنێت. (٢) خوێندنی پەپوو.
(٣) دەنگێکی وەها
*v.i.* پەپوو خوێندن؛ پرتاندنی دەنگێکی وەها.
*v.t.* ووتن و ووتنەوە جار لەدوای جار (وەك خوێندنی پەپوو کە وەستانی نییە).
*adj.* [Slang], شێت؛ گەوج؛ بێ مێشك؛ مێشك سووك.
**cuckoo in the nest,** میوانێکی ناپەسەندی نەویستراو؛ خۆسەپێنەر.
**cuckoo clock,** کاتژمێری پەپوو. کاتژمێرێکی سەر دیوارە وێنەی پەپوویەکی تێدایە و هەموو سەری سەعاتێك لێدەدات و دەنگی لێدانەکەی لاسایی خوێندنی پەپوو دەکاتەوە.
**cuculiform** (kyoo-kū′li-fôrm´), *adj.* تایبەتی بە پەپوو وە باڵندەی تری هەمان بابەت.
**cucullate** (kū′kə-lāt´, kyoo-kul′āt), *adj.* کڵاودار (وەك گەڵای گوڵە وەنەوشە).
**cucumber** (kū′kum-bẽr), *n.* (١) خەیار (٢) ڕووەکی خەیار
**cool as cucumber,** (١) هێمن؛ لەسەرخۆ. (٢) فێنك
**cucumiform** (kyoo-kū′mi-fôrm´), *adj.* وەك خەیار؛ لە خەیار چوو
**cucurbit** (kyoo-kũr′bit), *n.* (١) کوولەکەی ملدار؛ کوولەکەی بانقە- باغی (٢) شووشەیەکی گەورەی دەم پان کە لە کوولەکەی ملدار دەچێت
**cud** (kud), *n.* (١) قەپی کاوێژکراو؛ ئەو قەپەی کاوێژ دەکرێت.
(٢) پڕ بە دەمێك شتی جوین (وەك تووتن).
**chew the cud,** بیرکردنەوە
**cuddle** (kud′′l), *v.t.* باوەش پێداکردن و یاری لەگەڵ کردن لەڕووی خۆشەویستییەوە؛ دەست کردنە مل و چاوباشقاڵی کردن.
*v.i.* دەست کردنە مل بە پاڵکەوتن یا دانیشتنەوە و چاوباشقاڵی کردن.
*n.* (١) باوەش کردن. (٢) دەست لە مل کردن و چاوباشقاڵی کردن.

**cuddlesome** (kud′′l-səm), *adj.* = **cuddly.**
**cuddly** (kud′li), *adj.* حەزکەر لە دەست کردنە مل و چاوباشقاڵی کردن؛ بۆ دەست لە مل کردن و چاوباشقاڵی لەگەڵ کردن باشە: ***( a ~ girl)*** .
**cuddy** (kud′i), *n.* (١) (ا) ژووروچکەی ناو پاپۆڕ.
(ب) چێشتخانەی ناو پاپۆڕ. (٢) ژووروچکە؛ خانەی دۆڵاب.
**cuddy** (kud′i), *n.* [Scot.], کەر؛ گوێ درێژ.
**cudgel** (kuj′əl), *n.* دار؛ دارحەیزەران؛ داردەست؛ کوتەك.
*v.t.* دارکاری کردن؛ فەلاقەکردن.
**cudgel one's brains,** زۆر بە قورسی بیرکردنەوە.
**take up the cudgels for,** لەسەرکردنەوە؛ پشتیوانی کردن.
**cue** (kū), *n.* (١) ووریاکەرەوە: سەرنج ڕاکێشانێك یا هێمایەکە بۆ ئەکتەر کە نۆرەی هاتووە بۆ خۆنوواندن وە هەروەها بۆ لێپرسراوانی پەردەو ڕووناکی و دەنگی سەر شانۆ. (٢) سەرنج ڕاکێشانێك (بۆ کردنی کارێك).
(٣) ئەو ڕۆڵەی ئەکتەرێك لە شانۆگەرییەکدا دەیبینێت. (٤) نەخشە؛ پلان.
*v.t.* [Colloq.], سەرنج ڕاکێشان؛ ووریاکردنەوە؛ پێ ووتن (بۆ کردنی شتێك)
**cue** (kū), *n.* (١) ڕیز؛ وەستان لە ڕیزدا بۆ چاوەڕێ کردنی شتێك؛ سەرە.
(٢) داری بلیارد.
*v.t.* هۆنینەوە (پرچ).
**cue ball,** تۆپی لێدراو: ئەو تۆپەی یاریکەری بلیارد بە دارەکەی لێی دەدات.
**cuesta** (kwes′tə), *n.* گردێکە دیوێکی زۆر لێژەو دیوەکەی تری لێژاییی زۆر کەمترە.
**cuff** (kuf), *n.* (١) سەرقۆڵی کراس؛ سەردەستی کراس.
(٢) دەرەلنگی هەڵکراوی پانتۆڵ. (٣) کەلەپچە.
*v.t.* (١) سەردەست خستنەسەر قۆڵی کراس. (٢) کەلەپچە کردنە دەست.
**off the cuff,** [Slang], لەسەرلا (ووتە)؛ سەرپێیی (ووتە).
**cuff** (kuf), *v.t.* زللە لێدان.
*n.* زللە.
**cuff button,** قۆپچەی سەردەستی کراس.
**cuff link,** ئەڵقەی سەر قۆڵی کراس (کە بە قۆڵی کراسەکەوە نەدووراوە).
**cuirass** (kwi-ras′), *n.* (١) قەڵغانی بەرسنگ و پشت.
(٢) قەڵغانی بەرسنگ. (٣) قاوغ (زیندەوەرزانی).
**cuirassier** (kwi´rə-sêr′), *n.* سەربازێکی ئەسپ سواری قەڵغان لەبەر.
**cuisine** (kwi-zēn′), *n.* (١) چێشتخانە.
(٢) شێوازی چێشت لێنان: ***( Chinese ~ )*** .
(٣) چێشت: ***( The ~ is excellent in this restaurant.)***
**cuisse** (kwis), *n.pl.* قەڵغانی ڕان و سمت.
**culch** (kulch), *n.* = **cultch.**
**cul-de-sac** (kul′də-sak´, kool′də-sak´), *n.* (١) کوێرە کۆڵان؛ کۆڵانی دەرنەچوو. (٢) تەنگ و چەڵەمە؛ بار یا شوێنێك کە دەربازبوونی نەبێت.
**-cule** (kūl), پاشگری ناوە نیشانەی بچووك کردنەوەیە.
**culex** (kū′leks), *n.* جۆرە مێشوولەیەکە.
**culinary** (kū′lə-ner´i), *adj.* (١) تایبەتی بە چێشتخانە؛ چێشتخانەیی. (٢) تایبەتی بە چێشت لێنان.
**cull** (kul), *v.t.* (١) هەڵبژاردن؛ پەسەندکردن و هەڵبژاردن؛ هەڵگرتن.
(٢) هەڵبژاردن و کۆکردنەوە؛ هەڵبژاردن و کردنەوە (گوڵ).
(٣) پاك و پیس کردن؛ لێ ووردبوونەوە پێش هەڵبژاردن یا هەڵگرتن
*n.* (١) پاك و پیسکاری؛ هەڵبژاردن.
(٢) شتێکی هەڵنەبژێرراو (لەبەر خراپی).
**cullender** (kul′ən-dẽr), *n.* = **colander.**
**cullet** (kul′it), *n.* پارچە شووشەی شکاو (کە دەشێت و بۆ تواندنەوەو سەرلەنوێ بەکارهێنانەوەی).
**cullis** (kul′is), *n.* ئاوەڕۆ (سەربان)؛ ئاوەڕۆکە.
**cully** (kul′i), *n.* (١) [Rare] ، کەسێکی ساویلکەو گێژۆکە.
(٢) [British Slang]، برادەر؛ هەڤاڵ؛ کابرا.
*v.t.* [Obs.], خەڵەتاندن؛ فریواندن.

**dark** (därk), *adj.* (١) تاریك. (٢) ڕەش (قژ، چاو، هەور).
(٣) ڕەشکەلە؛ ڕەشباو؛ دێز. (٤) شاراوە؛ لێڵ؛ نادیار.
(٥) غەمبار؛ دڵگیر: ***( ~ thoughts)*** .
(٦) ڕەش؛ خراپ: ***( the ~ side of things)*** .
(٧) نەزان؛ بێ ئاگا؛ تاریك: ***( the D~ Ages)*** .
(٨) تۆخ یا تێر (ڕەنگ)؛ تەلخ: ***( ~ brown)*** .
*n.* (١) تاریکی. (٢) شەو؛ شەو داهاتن. (٣) لێڵی؛ نادیاری.
(٤) نهێنیتی. (٥) نەزانین؛ نەزانی؛ بێ ئاگایی. (٦) ڕەنگێکی تۆخ یا تێر.
**in the dark,** بێ ئاگا
***( I was in the dark of what was happening.)***
**keep dark,** شاردنەوە؛ دەرنەخستن؛ بە نهێنی هێشتنەوە.
**shoot in the dark,** پلاری کوێرانە هاویشتن.
**Dark Ages, dark ages,** سەدانی تاریك؛ سەدانی تاریکی و نەزانی
(ساڵی ٤٧٦–١٤٥٠ ی زایینی)؛ سەدانی ناوەڕاست.
**Dark Continent,** کیشوەری تاریك: ئەفەریقا.
**darken** (där'kən), *v.i.* تاریك بوون؛ تاریکتربوون.
*v.t.* تاریك کردن؛ تاریکتر کردن.
**darkey, darkie** (där'ki), *n.* = **darky.**
**dark horse,** (١) ئەسپێکی نەناسراوی براوە کە کەس بەتەمای ئەوە
نەبووبێت بیباتەوە (پێشبڕکێی ئەسپ).
(٢) پێشبڕکێکەرێکی نەناسراو کە کەم
کەس بڵێت دەیباتەوە. (٣) کەسێکی نەناسراو کە ناودێر دەکرێت بۆ پلەیەکی
بەرز یا بۆ نوێنەرایەتی حیزبێك لە هەڵبژاردندا.
**darkish** (där'kish), *adj.* ڕەشباو؛ ڕەشکەلە؛ تاریکباو.
**darkle** (där'k'l), *v.i.* تاریك نواندن؛ تاریك بوون؛ ڕەش بوون.
**darkling** (därk'liŋ), ***adv. & adj.*** [Poetic], لە تاریکیدا؛ تاریك؛
بە تاریکی.
**darkly** (därk'li), *adv.* (١) بە تاریکی؛ بۆ ئەوەی تاریك بنوێنێت.
(٢) بە لێڵی؛ بە خراپی.
(٣) بەئاستەم (لەبەر نەبوونی ڕووناکی یا لەبەر تاریکی):
***( For now we see through a glass ~ .)***
**darkness** (därk'nis), *n.* (١) تاریکی. (٢) ڕەشی؛ ڕەشێتی.
(٣) کوێری. (٤) نەزانین؛ نەزانی. (٥) پەستی؛ غەمباری؛ دڵگیری.
(٦) لێڵی؛ نادیاری. (٧) بەدی؛ خراپی.
**darkroom** (därk'rōōm', därk'room'), *n.* ژووری تاریك: بۆ
شتنەوەی وێنە.
**darksome** (därk'səm), *adj.* [Poetic], (١) تاریك؛ ڕەشباو؛
ڕەشکەلە. (٢) دڵگیر؛ پەستکەرو ناخۆش. (٣) لێڵ.
**darky** (där'ki), *adj. Also* **darkey, darkie** [Colloq.], قولەڕەش
(لەڕووی سووکییەوە).
**darling** (där'liŋ), *n.* کەسێکی زۆر خۆشەویست؛ ئازیز؛ گیان؛ ڕۆڵە:
***( come here, my ~ !)***
***adj.*** (١) زۆر خۆشەویست. (٢) بێزوو بۆ کراو.
(٣) [Colloq.]، جوان؛ دڵفڕێن.
**darn** (därn), *v.t. & v.i.* دوورینەوە (گۆرەوی، جل‌وبەرگ)؛ چاکردن.
*n.* (١) دوورینەوە؛ چاکردن. (٢) شوێنێکی دووراوە یا چاك کراو.
**-darner** *(n.).*
**darn** (därn), ***v.t., n., adj., adv., interj.*** بە لەعنەت؛ لەعنەت لێ بوو؛
خواگرتوو؛ لەعنەتی.
**darnel** (där'n'l), *n.* دابووجان.
**darning** (där'niŋ), *n.* (١) دوورینەوە (گۆرەوی، جل‌وبەرگ).
(٢) گۆرەوی و جل‌وبەرگی دووراوە یا پێویست بە دوورینەوە کردن.
**darning needle,** (١) دەرزی گۆرەوی و جل‌وبەرگ دوورینەوە.
(٢) **dragonfly** .
**dart** (därt), *n.* (١) (ا) تیر؛ نێزە؛ ڕمێکی بچووك. (ب) تیری وەك پەڕ.
(٢) (*pl.*)، یاری تیربازی: بریتییە لە تێگرتنی تیری وەك پەڕ لە نیشانێك.
(٣) جووڵەیەکی لەپڕو خێرا. (٤) چزوو (هەنگ، زەردەواڵە، دووپشك).
*v.t. & v.i.* (١) تیرتێگرتن؛ تیرپێوەنان بە خێرایی؛ دەرچوون وەك تیر؛ پێکان.
(٢) جووڵانەوە لەپڕو بە خێرایی.
**Darwinism** (där'win-iz'm), *n.* (١) فەلسەفەو بیروباوەڕی داروین
زانای سرووشتی ئینگلیزی کە بریتییە لە بیردۆزی مانەوە بۆ توخمی باشترو
بەهێزتر لەناو زیندەوەراندا. (٢) لەسەر فەلسەفەو بیروباوەڕی داروین ڕۆیشتن.
**-Darwinian** *(adj.)*; **Darwinist** *(adj. & n.)*; **Darwinistic** *(adj.)*.
**dash** (dash), *v.t.* (١) ووردوخاش کردن؛ شکاندن؛ تێك‌وپێکدان.
(٢) پێدادان بەتوندی؛ خۆپیادان.
(٣) ( **~ away ; ~ down** )، فڕێدان؛ دان بە زەویدا:
***( He ~ed down his broken sword and picked up another one.)***
(٤) ئاو لێ هەڵپرژاندن؛ ئاوپیاکردن:
***( D~ some water on this muddy floor.)***
(٥) تێکەڵاوکردن (لەگەڵ ئەختێك شتی جیاوازدا).
(٦) ڕووخاندن؛ دڵشکست کردن؛ پێشێل کردن (هیوا)؛ ناکام کردن:
***( All his hopes were ~ed.)***
(٧) تەریق کردنەوە.
(٨) ( **~ off** )، نووسین و ناردن بەپەلە؛ بەپەلە کردن:
***( I must ~ off a few letters before I go out.)***
*v.i.* (١) پێدادان بەتوندی. (٢) بەپەلە ڕۆیشتن یا دەرپەڕین.
*n.* (١) پێدادانێکی توند؛ لێدانێکی قایم.
(٢) شڵپە: ***( The ~ of the waves on the beach)*** .
(٣) ئەخت؛ تۆز: ***( I put a ~ of salt in the salad.)*** .
(٤) دەرپەڕین؛ بەپەلە ڕۆیشتن.
(٥) پێشبڕکێ یا ڕاکردنێکی خێراو کورت: ***( a hundred-meter ~ )*** .
(٦) چالاکی و وریایی و قۆزی و تەڕپۆشی.
(٧) دەشبوول (ئوتومبیل). (٨) کشتەك (خاڵبەندی).
**make a dash for,** بەخێرایی و لەپڕ ڕاکردن بەرەو؛ تێ تەقاندن بەرەو:
***( The prisoner made a dash for freedom.)***
**dashboard** (dash'bôrd', dash'bōrd'), *n.* دەشبوول.
**dasher** (dash'ẽr), *n.* (١) کرداری ( **dash** ) (وشەی پێشووتر ببینە).
(٢) [Colloq.]، کەسێکی چالاك و وریا و قۆزو تەڕپۆش.
**dashing** (dash'iŋ), *adj.* چالاك و وریا و قۆزو تەڕپۆش؛ قۆز:
***( a ~ young man)***
**dashy** (dash'i), *adj.* = **dashing.**
**dastard** (das'tẽrd), *n.* کەسێکی ترسنۆك و نزم کە بە دزییەوە دەستی
خۆی دەوەشێنێت؛ نامەرد.
***adj.*** نامەرد؛ ترسنۆك و نزم و نهێنگر.
**-dastardliness** *(n.).*
**dastardly** (das'tẽrd-li), *adj.* نامەردانە؛ ترسنۆکانە و نهێنگرانە:
***( a ~ act)***
**data** (dā'tə, dat'ə, dä'tə), *n.* زانیاری.
**date** (dāt), *n.* (١) (ا) بەروار (ڕۆژ): ***( What's the ~ today?)*** .
(ب) بەروار (ساڵ): ***( What is the ~ of the discovery of America?)*** .
(ج) ڕۆژ؛ کات: ***( since that ~ )*** .
(٢) چەرخ؛ سەردەم؛ ماوە.
(٣) [Colloq.]، ژوان: ***( He had a ~ with a girl yesterday.)*** .
(٤) هاوژوان: ***( His ~ is pretty.)*** .
*v.t.* (١) بەروار لەسەر دانان (نامە).
(٢) دۆزینەوە و دیاریکردنی بەرواری ڕووداوێك.
(٣) [Colloq.]، ژوان بەستن؛ ژوان لەگەڵدا بوون.
*v.i.* (١) ( **~ from ; ~ back to** )، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتە:
***( The castle ~s back to the 14 th century.)***

(٢) باو نەمان؛ کۆن بوون.
(٣) [Colloq.]، ژووان لەگەڵدا بوون؛ ژووان بەستن.
**out of date,** باو نەماو؛ کۆن.
**to date,** تا ئێستا.
**up to date,** نوێ؛ بەگوێرەی شێوازو پێویستی ئەمڕۆ یا ئەم چەرخە.
**date** (dāt), *n.* (١) خورما. (٢) دارخورما.
**dated** (dāt'id), *adj.* (١) بەرواری لەسەرە (نامە، بڕوانامە، پەرتووك).
(٢) باو نەماو؛ کۆن.
**dateless** (dāt'lis), *adj.* (١) بێ بەروار (٢) بێ سنوور.
(٣) زۆر دەمێکە هەیە؛ زۆر کۆنە بەڵام باوی هەر ماوە. (٤) هەرگیز کۆن نابێت.
**dateline** (dāt'līn'), *n.* هێڵی بەروار دێڕێکە لە ڕۆژنامە یا گۆڤارێکدا بەروارو شوێنی بڵاوکردنەوەی پیشان دەدات.
**date line,** هێڵێکی نەبینراوە لە تەوەری باکوورەوە بۆ باشوور بۆ دیاریکردن و گۆڕینی بەروار (کەشتیەوانی).
**date palm,** دارخورما.
**dative** (dā'tiv), *adj.* تایبەتی بە باری کارلێکراو (ڕێزمان).
*n.* (١) باری کارلێکراو (ڕێزمان) وەك ووشەی ( **him** ) لەم ڕستەیەدا:
**( I gave him the book. )**
(٢) ووشەیەك کە ئەرکی کارلێکراو دەبینێت.
**datum** (dā'təm, dat'əm), *n. singular of* **data.**
**datura** (də-tyoor'ə), *n.* ڕووەکێکە بۆ سڕکردن یا سەرخۆش کردن بەکاردەهێنرێت.
**daub** (dôb), *v.t. & v.i.* (١) گەچ، ڕۆن، یا بۆیە لێدان.
(٢) پیس کردن. (٣) وێنەکێشان بە نەشارەزایانە.
*n.* (١) ماددەیەکی وەك گەچ، ڕۆن، یا بۆیەیە کە لە شتێك دەدرێت.
(٢) لێدانێکی وەها بە فڵچە.
(٣) وێنەیەکی ناڕێك وپێك و بە نەشارەزایانە کێشراو.
**daughter** (dô'tēr), *n.* کچ؛ منداڵی مێینە
***( They have two sons and a ~ .; A girl is the ~ of her father and mother.)***
**daughter-in-law** (dô'tēr-'n-lô'), *n.* بووك؛ ژنی کوڕ.
**daughterly** (dô'tēr-li), *adj.* کچانە؛ بۆ کچی یەکێك دەشێت.
**daunt** (dônt, dänt), *v.t.* ترساندن؛ تۆقاندن
**dauntless** (dônt'lis, dänt'lis), *adj.* چاونەترس؛ ئازا
**davenport** (dav'ən-pôrt', dav'ən-pōrt'), *n.* (١) قەنەفەیەکی گەورە (کە دەکرێتەوەو دەبێت بە جێی نووستن). (٢) مێزی نووسین.
**davit** (dav'it), *n.* (١) ئاسنێکی بەرزی سەرچەماوەیە لە قەراغی پاپۆڕدا بەلەمی پێ بەرزدەکرێتەوەو دادەبەزێنرێت. (٢) ئاسنێکی وەها بۆ لەنگەر- هەڵدان و هەڵکردن؛ لەنگەرکێش
**daw** (dô), *n.* قەلەباچکە.
**dawdle** (dô'd'l), *v.i. & v.t.* کات بەفیڕۆدان (هەندێ جار لەگەڵ ووشەی ( **away** ) دا بەکاردەهێنرێ):
***( Stop ~ing and do something useful! ; Don't ~ away your time.)***
**dawn** (dôn), *v.i.* (١) ڕۆژبوونەوە؛ بەرەبەیان کەوتن؛ شەبەق دان.
(٢) ( **~ on ; ~ upon** )، بۆ دەرکەوتن:
***( The truth at last ~ed on him. ; The meaning suddenly ~ed on me.)***
*n.* (١) بەرەبەیان؛ کازیوە؛ شەبەق.
(٢) سەرەتا ***( the ~ of civilization)*** .
**day** (dā), *n.* (١) ڕۆژ؛ ڕۆژگار
(٢) ڕۆژ؛ شەو و ڕۆژ ***( There are seven days in a week.)*** .
(٣) ڕووناکی؛ هەتاو.
(٤) [D-]، ڕۆژێکی تایبەتی: ***( Independence D~ )*** .
(٥) چەرخ؛ سەردەم: ***( He was the best writer of his ~ .)*** .
(٦) کاتی لەبرەوداببوون و دەسەڵاتداری: ***( He has had his ~ .)*** .
(٧) پێشبڕکێی ڕۆژێك: ***( We lost the ~ .)*** .
(٨) کاتی کارکردن لە ڕۆژێکدا: ***( an eight-hour ~ )*** .
(٩) کاتێکی دیاری نەکراو: ***( One of these ~s)*** .
(١٠) کات: ***( the present ~ )*** .
(١١) هەل؛ ڕۆژی هەل: ***( My ~ has come.)*** .
(١٢) (*pl.*)، ژیان: ***( He spent his ~s in study.)*** .
**call it a day, [Colloq.],** دەست لە کار هەڵگرتن؛ پایدۆس لێکردن.
**day after day,** هەموو ڕۆژێك؛ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ.
**day by day,** ڕۆژ بە ڕۆژ؛ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ.
**day in, day out,** هەموو ڕۆژێك.
**from day to day,** لەم ڕۆژەوە بۆ ئەو ڕۆژ بەبێ بیرکردنەوە لە دواڕۆژ:
***( He lives from day to day.)***
**daybreak** (dā'brāk'), *n.* بەرەبەیان؛ کازیوە؛ شەبەق.
**daydream** (dā'drēm'), *n.* دالفە؛ زەرەخەو؛ خەیاڵ؛ خەون.
*v.i.* دالفەلێدان؛ زەرەخەو بینین.
**day in court,** (١) ئەو ڕۆژەی یەکێك داواکەی لە دادگادا دەبیسترێ.
(٢) هەلی ماف داواکردن؛ ڕۆژێك کە داواو خواستی کەسێك دەبیسترێ لەلایەن بەرامبەرەکەیەوە: ***( We will have our day in court soon.)*** .
**day laborer,** کرێکاری ڕۆژانەی بێ بەهرە.
**day letter,** برووسکەی ڕۆژ: برووسکەیەکە بە ڕۆژ دەنێردرێت، هەرزانترو هێواشترە لە برووسکەی ئاسایی.
**daylight** (dā'līt'), *n.* (١) ڕووناکی ڕۆژ؛ هەتاو؛ ڕووناکی.
(٢) بەرەبەیان؛ کازیوە؛ شەبەق. (٣) ڕۆژگار؛ ڕۆژ.
(٤) ڕوون بوونەوە؛ ڕوونی.
(٥) بەرەو کۆتایی ئەرکێك: ***( We can now see ~ ahead.)*** .
(٦) (*pl.*)، [Slang]، هۆش؛ هۆشیاری:
***( You scared the ~s out of me. ; to beat the ~s out of)***
**daylight-saving time,** کاتی هاوینە (کە یەك سات لەپێش کاتی زستانەوەیە کە پێی دەوترێ: " **standard time** " ) .
**daylong** (dā'lôŋ', dā'loŋ'), *adj. & adv.* بە درێژایی ڕۆژ:
***( We had a ~ conference.)***
**day nursery,** دایەنگای ڕۆژی منداڵان.
**Day of Judgment,** ڕۆژی قیامەت (ئاین).
**day school,** (١) قوتابخانەی ڕۆژ.
(٢) قوتابخانەی ڕۆژانە (کە قوتابی لە ماڵی خۆیدا دەژی نەك لە قوتابخانەکە).
**days of grace,** ماوەی بەخشین: ماوەی درێژکراوەی دانەوەی قەرزێك یا جێبەجێکردنی ئەرکێك.
**daystar** (dā'stär'), *n.* (١) ئەستێرەی کاروانکوژ؛ ئەستێرەی بەرەبەیان.
(٢) [Poetic]، خۆر.
**daytime** (dā'tīm'), *n.* ڕۆژگار.
**daze** (dāz), *v.t.* (١) وڕکردن؛ حەپەساندن؛ گێژکردن.
(٢) سەر لێ شێواندن (بە ڕووناکی، شەوقی زۆر یا بە جوانی)؛ شەوارەکردن
*n.* وڕی؛ حەپەساوی؛ سەرسامی؛ گێژی: ***( He was in a ~ .)*** .
**-dazed** *(adj.)*; **dazedly** *(adv.)*.
**dazzle** (daz''l), *v.t.* (١) کوێرکردن بە شەوق و بریقەی ئێجگار زۆر؛ شەوارەکردن. (٢) دڵفڕاندن بە جوانی و خۆنواندنێکی سەرسووڕمێنەرو بریقەدار.
*v.i.* (١) کوێربوون بە شەوق و بریقەی ئێجگار زۆر؛ شەوارەبوون.
(٢) واق وڕمان و دڵفڕان بە خۆنواندنێکی جوانی دڵفڕێن:
***( He was ~d by her beauty and charm.)***
*n.* شتێکی جوان و دڵفڕێن و سەرسووڕمێنەرو بریقەدار.
**-dazzler** *(n.)*.
**dazzling** (daz''l-iŋ), *adj.* جوان و دڵفڕێن و بریقەدارو سەرسووڕمێنەر:
***( her ~ beauty; a ~ sun; a ~ show)***

**D-Day** (dē'dā´), *n.* (۱) ڕۆژی دەستپێکردنی هێرشێکی سوپایی؛ ڕۆژی دەستپێکردنی هەرچی جۆرە هێرشێك یا ئەرکێکی گرنگ.
(۲) ڕۆژی دابەزینی هێزی سوپایی ئەمەریکاو ئینگلتەرە لە فەرەنسا بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا (ڕۆژی ٦ ی- حوزەیرانی ١٩٤٤).

**de-** (di, də, de, dē), پێشگرێکە بەمانای: (۱) لێ دوورکەوتنەوە؛ دابەزین ***( detrain)*** .
(۲) بە ناخداچوون: ***( decline, depress)*** .
(۳) بە تەواوی: ***( defunct)*** .
(٤) لابردن: ***( dethrone)*** .
(٥) (ا) پێچەوانەکردن؛ بە دژ جووڵانەوە؛ هەڵوەشانەوە: ***( defrost)*** .
(ب) لێ لابردن ***( decaffinate)*** .

**deacon** (dē'k'n), *n.* ڕابەری کڵێسە؛ یاریدەدەری قەشە.
***v.t.*** (۱) ( ~ off )، خوێندنەوەی ئینجیل بە دەنگی بەرز لەبەردەمی نوێژکەراندا لە کڵێسە. (۲) دانانی میوە لە فرۆشگایەکدا یا پێچانەوەی بە جۆرێك کە باشەکەی دەرکەوێت و خراپەکەی لە ژێرەوە بێت. (۳) بە سەرچەوتی کارکردن.

**deaconess** (dē'k'n-is), *n.* یاریدەدەری قەشە (بەتایبەتی ئافرەت کە سەرەوکاری هەژارو نەخۆش دەکات).

**deaconry** (dē'k'n-ri), *n.* (۱) پلەی یاریدەدەری قەشە.
(۲) یاریدەدەرانی قەشە.

**deactivate** (dē-ak'tə-vāt´), *v.t.* (۱) بەردانی ئۆردوو، هێز، یا بەتالیۆنی سوپا.
(۲) پووچەڵ کردنەوە؛ پەکخستن؛ بەتاڵ کردنەوە (مین، بۆمبا):
***( to ~ a bomb, mine, etc.)***

**dead** (ded), *adj.* (۱) (ا) مردوو ***( a ~ person)*** .
(ب) تۆپیو ***( a ~ animal)*** . (۲) خامۆش؛ کپ: ***( a ~ city)*** .
(۳) بێ تین و ورزە؛ بێ هەست؛ سارد؛ مردوو. (٤) وەستاو: ***( ~ waters)*** .
(٥) هەڵ نابەزێتەوە؛ بەکارنەماوە: ***( a ~ tennis ball)*** .
(٦) مردوو؛ کۆن؛ بەکارنەهێنراو: ***( ~ languages; ~ laws)*** .
(۷) کوژاوە؛ خەفەکراو: ***( a ~ fire)*** .
(۸) مردوو (مەجاز)؛ لەکارکەوتوو: ***( a ~ battery)*** .
(۹) سارد؛ ووشك؛ بێ کەیف؛ مردوو (ناهەنگ): ***( a ~ party)*** .
(۱۰) بێ پیت؛ مردوو (خاك): ***( ~ soil)*** .
(۱۱) ئەنی دەدات؛ دەی پێکێت؛ ڕاست (گوللە): ***( a ~ shot)*** .
(۱۲) تەواو؛ تەواوی: ***( a ~ loss)*** .
(۱۳) بێ خاوەن (نامە): ***( ~ letters)*** . (۱٤) [Colloq.]، ماندوو؛ هیلاك.
(۱٥) کارەبای لەسەر نییە (تەل): ***( a ~ wire)*** . (۱٦) بێ ماف (دادگەری).
(۱۷) لەکارکەوتوو؛ بێ کارەبا: ***( a ~ microphone)*** .
***n.*** تاریکترین و ساردترین کاتی شەو یا زستان؛ نیوەشەو؛ ناوەڕاستی زستان:
***( the ~ of winter; the ~ of night)***
***adv.*** (۱) بە تەواوی؛ تەواو: ***( You are ~ wrong.)*** .
(۲) ڕاستەوخۆ؛ ڕاست: ***( ~ ahead)*** .
**the dead,** مردووان؛ مردووەکان.

**dead-beat** (ded'bēt´), *adj.* [Colloq.], ماندوو؛ زۆر ماندوو.

**dead beat,** [Slang], (۱) مفتەخۆر؛ مشەخۆر.
(۲) کەسێکی تەمەڵ و بێ ئیش وکار.

**deaden** (ded''n), *v.t.* (۱) مراندن؛ هەست کوشتن؛ هێز لێ بڕین.
(۲) سڕکردن؛ بەنج کردن. (۳) کپ کردن؛ خەفەکردن. (٤) دەنگ نەهێشتن.
***v.i.*** مران؛ هەست نەمان؛ هێز لێ بڕان.

**dead-end** (ded'end'), *adj.* (۱) دەرنەچوو (کۆڵان، شەقام)؛ کوێرە کۆڵان؛ کوێرە شەقام: ***( a ~ street)*** .
(۲) بێ داڕۆژ: ***( a ~ job)*** .

**deadhead** (ded'hed'), *n.* (۱) مفتەخۆر؛ مشەخۆر: کەسێك کە بە بلیتی خۆڕایی دەچێت بۆ سینەما یا بە شەمەندەفەر گەشت دەکات.
(۲) فڕۆکە، شەمەندەفەر، یا پاسێکی بێ ڕێبوار. (۳) کەسێکی بێ مێشك.

**dead heat,** پێشبڕکێی هاوکێشی: پێشبڕکێیەك کە دوو کەس تێیدا هاوتا دەردەچن.

**dead letter,** (۱) یاسای مردوو: یاسایەکە کە ئیتر کاری پێ ناکرێ، بەڵام هەڵنەوەشاوەتەوە. (۲) نامەی مردوو: نامەیەکی بێ خاوەن یا نامەیەك کە ناوونیشانەکەی ناتەواوە و پاش ماوەیەك یا دەفەوتێنرێ یا دەگەڕێنرێتەوە بۆ نێرەر.

**dead-letter office,** بەشی نامەی مردوو لە پۆستەخانە. (ووشەی پێشوو ببینە).

**deadline** (ded'līn´), *n.* (۱) سنوور یا هێڵی مردن: سنوورێکی دەوری بەندیخانەیە کە نابێت هیچ بەندێك ئەوی تێپەڕ ببێت ئەگینا تەقەی لێ دەکرێ.
(۲) سنووری قەدەغەکراو.
(۳) دوا کات (بۆ دانەوەی قەرز، کرێدان، جێبەجێکردنی کارێك... هتد).

**deadliness** (ded'li-nis), *n.* کوشندەیی؛ بکوژی.

**deadlock** (ded'lok´), *n.* گیرخواردن؛ چەقین؛ وەستان (گفتوگۆ)؛ نەتوانینی دوو لا بۆ ڕێکەوتن و گیرخواردنی گفتوگۆی نێوانیان:
***( The two parties are at ~ .)***
***v.t.*** گیر پێ خواردن؛ وەستاندن.
***v.i.*** گیرخواردن؛ چەقین؛ وەستان: ***( The negotiations are ~ed.)*** .

**deadly** (ded'li), *adj.* . (۱) کوشندە؛ بکوژ: ***( a ~ poison; ~ force)***
(۲) تەنها بە مردن کۆتایی دێت؛ هەتا مردن: ***( a ~ enemy; ~ combat)*** .
(۳) لە مردن دەچێت (ڕەنگ): ***( ~ white)*** .
(٤) لە ڕادە بەدەر.
(٥) [Colloq.]، زۆر ووشك و ناخۆش: ***( a ~ party)*** .
***adv.*** (۱) لە مردن دەچێت. (۲) زۆر؛ لە ڕادە بەدەر؛ ئێجگار.

**deadly sins,** گوناهە کوشندەکان (ئاین).

**dead march,** ئاوازێکی دڵگیرە لە بردنی تەرم بۆ گۆڕستان لێ دەدرێت.

**dead-pan** (ded'pan´), *adj. & adv.* [Slang], دەم‌وچاو مردوو؛ دەم‌وچاوی سارد و بێ هەست.

**dead set,** (۱) هەوڵدانێك بە هەموو توانایەکەوە.
(۲) [Colloq.]، سووربوون لەسەر:
***( He was ~ on having his own way.)***

**dead weight,** (۱) سەنگی مردوویەك یا شتێکی بێ گیان و خۆنەبزوێن.
(۲) بارێکی قورس: ***( the ~ of poverty)*** .
(۳) کێشی ئۆتۆمبیلێك بەبێ بارەکەی.
(٤) بارێك کە بەپێی کێشەکەی کرێی لەسەر دەدرێت، نەك قەبارەکەی.

**deadwood** (ded'wood´), *n.* (۱) لق و پۆپی ووشکی دار.
(۲) کەسێك یا شتێکی بێ کەڵك کە ببێت بە بارێکی گران.

**deaf** (def), *adj.* (۱) کەڕ.
(۲) خۆکەڕکەر؛ گوێنەگر: ***( He was ~ to her please.)*** .

**deaf-and-dumb** (def'ən-dum'), *adj.* (۱) کەڕولاڵ.
(۲) تایبەتی بە کەڕولاڵەکان.

**deafen** (def''n), *v.t.* (۱) کەڕکردن بە دەنگی زۆر بەرز.
(۲) دەنگبڕکردن.

**deafening** (def''n-iŋ), *adj.* (۱) کەڕکەر (وەك دەنگێکی زۆر بەرز): ***( a ~ noise)*** . (۲) بە ژاوەژاو؛ بە دەنگەدەنگ. (۳) دەنگبڕکەر.
***n.*** شتی دەنگ پێ بڕکەر (خانووسازی).

**deaf-mute** (def'mūt'), *n.* کەسێکی کەڕولاڵ.
***adj.*** کەڕولاڵ.

**deal** (dēl), *v.t.* (۱) دابەشکردن؛ بەشکردن.
(۲) لێدان؛ پیاکێشان؛ پیاماڵین: ***( He dealt his opponent a blow.)***
(۳) دابەشکردنی کاغەزی یاری بەسەر یاریکەرەکاندا.
***v.i.*** (۱) ( ~ with )، لێکۆڵینەوە؛ پێوە خەریك بوون:
***( Science ~s with facts.)***
(۲) ( ~ with )، ڕەفتار لەگەڵ کردن؛ لەگەڵ جووڵانەوە:
***( to ~ fairly with others)***

***(to ~ with a problem)*** (٣) ( ~ with )، چارەکردن؛ چارەسەرکردن:

(٤) ( ~ with )، سەوداگەری کردن؛ کرین و فرۆشتن؛ ئاڵوێرکردن:
***(to ~ with a company, store, etc.)***

(٥) پێدان یا دابەشکردنی کاغەزی یاری یا قومار بەسەر یاریکەرەکاندا.

***n.*** (١) (ا) دابەشکردنی کاغەزی یاری. (ب) ئەو کاغەزانەی دابەش کراون.
(ج) نۆرەی یاریکەر بۆ دابەشکردنی ئەم کاغەزانە. (د) دەستێك یاری کردن.
(٢) بەشکردن؛ دابەشکردن.
(٣) [Colloq.]، رێکەوتنێکی بازرگانی یا سەوداگەری.
(٤) [Colloq.]، رێکەوتنێکی نهێنی رامیاری.
(٥) [Colloq.]، رێکەوتنێك لەسەر نەخشەیەك یا ئاڵوێرێك.

**deal** (dēl), ***n.*** هەندێکی دیاری نەکراو؛ هەند.
**a good ( or great ) deal,** زۆر؛ هەندێکی زۆر:
***(He spent a great deal of money.; You have wasted a good deal of time.)***

**dealer** (dēl'ēr), ***n.*** (١) دەڵاڵ؛ فرۆشیار؛ کڕیارو فرۆشیار؛ سەوداکەر؛ بازرگان (٢) دابەشکەری کاغەزی یاری یا قومار بەسەر یاریکەر یا قومارکەرەکاندا.

**dealing** (dēl'iŋ), ***n.*** (١) بەشکردن؛ دابەشکردن.
(٢) رەفتار؛ رەوشت. (٣) (*pl.*)، بازرگانی؛ ئاڵوێر.
(٤) چۆنێتی رەفتارکردنی بازرگانی.

**dealt** (delt), *past tense and past participle of* deal.

**dean** (dēn), ***n.*** (١) سەرۆك یا بەرێوەبەری کڵێسەیەکی گەورە.
(٢) سەرۆك یا بەرێوەبەری کۆلیج.
(٣) کۆنترین و شارەزاترین ئەندامی پیشە، کۆمەڵە، یا یانەیەك:
***(the ~ of the diplomatic corps)***

**deanery** (dēn'ēr-i), ***n.*** پلەوپایەی سەرۆکی کۆلیج یا سەرۆکی کڵێسەیەکی گەورە؛ فەرمانگەی سەرۆکێکی وەها.

**deanship** (dēn'ship´), ***n.*** پلەوپایەو ماوەی مانەوەی بەرێوەبەری کۆلیج یا سەرۆکی کڵێسەیەکی گەورە؛ بەرێوەبەرایەتی کۆلیج.

**dear** (dêr), ***adj.*** (١) خۆشەویست؛ زۆر خۆشەویست؛ گیان؛ شیرین.
(٢) (ا) بەرێز (سەرەتای نامە): ***(D~ Sir)*** .
(ب) خۆشەویستم (سەرەتای نامە بۆ هاورێیەك): ***(D~ Azad)*** .
(٣) (ا) بەنرخ؛ گران. (ب) گرانبەها.
(٤) راستەقینە؛ بەدڵ: ***(Our ~est hope)*** .
***adv.*** (١) بە خۆشەویستی. (٢) گران؛ گرانبەها.
***n.*** کەسێکی خۆشەویست؛ خۆشەویستم:
***(Come here, my ~. Yes, ~. ; No, ~.)***
***interj.*** غەمباری، پەستی و بێ ئارامی، یا سەرسامی دەردەبرێت:
***(Oh, ~! ; D~, me! ; D~, ~!)***

**dearly** (dêr'li), ***adv.*** (١) ئێجگار زۆر؛ بەراستی:
***(He would ~ love to see his mother again.)***
(٢) گران؛ گرانبەها: ***(Victory was ~ bought.)*** .

**dearth** (dûrth), ***n.*** (١) برسێتی؛ لە برسدا مردن.
(٢) کەمی؛ نەبوونی شت؛ بە دەگمەن دەستکەوتن.

**death** (deth), ***n.*** (١) مردن؛ مەرگ؛ کۆچی دوایی؛ گیان دەرچوون.
(٢) نەمان؛ کۆتایی؛ دوایی هاتن: ***(The ~ of one's hopes)*** .
(٣) باری مردن؛ مردن: ***(D~ comes to all men.)*** .
(٤) هۆی مردن: ***(That motorcycle will be the ~ of you.)*** .
(٥) رووداوێکی ناخۆش وەك مردن. (٦) کوشتن؛ خوێن رشتن.
(٧) [Obs.]، تاعوون: ***(the Black D~)*** .
**put to death,** کوشتن؛ هەڵواسین؛ لە سێدارەدان.
**to death,** زۆر؛ ئێجگار زۆر: ***(He worries me to death)*** .
**to the death,** هەتا مردن: ***(a fight to the death)*** .

**deathbed** (deth'bed´), ***n.*** (١) جێی مردن. (٢) سەرەمەرگ؛ گیانەلا.
***adj.*** لەکاتی سەرەمەرگدا کراو: ***(a ~ will)*** .

**death bell,** زەنگی بانگدانی مردنی کەسێك.

**deathblow** (deth'blō´), ***n.*** (١) پیاماڵینێك کە دەبێتە هۆی مردن.
(٢) لێدانێك یا پیاماڵینێکی کوشندە یا زیانبەخش.

**deathful** (deth'fəl), ***adj.*** (١) کوشندە؛ بکوژ.
(٢) مردن ئاسا؛ لە مردن چوو.

**deathless** (deth'lis), ***adj.*** نەمر.

**deathlike** (deth'līk´), ***adj.*** وەك مردن؛ مردن ئاسا.

**deathly** (deth'li), ***adj.*** (١) کوشندە؛ بکوژ. (٢) تایبەتی بە مردن.
***adv.*** زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ تا رادەیەکی زۆر: ***(~ afraid)*** .

**death mask,** قاڵبی دەموچاوی کەسێکی تازە مردوو.

**death rate,** تێکرای ژمارەی مردووانی شوێنێك لە ماوەیەکی تایبەتیدا.

**death-trap** (deth'trap´), ***n.*** تەڵەی مردن: (ا) خانوویەکی پەرپووت.
(ب) بارێکی ترسناك.

**death warrant,** (١) فەرمانی رەسمی لەسێدارەدانی کەسێك.
(٢) لێدانێکی کوشندە کە کۆتایییەکەی خۆشی و هیوا دێنێت.

**deathwatch** (deth'woch´, deth'wôch´), ***n.*** (١) ئێشکگرتنی کەسێکی مردوو هەتا کاتی ناشتنی دێت یا کەسێك کە لە سەرەمەرگدایە.
(٢) پاسەوانێکی بەندیخانە کە چاودێری بەندێك دەکات کە سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دراوە هەتا کاتی لەسێدارەدانەکەی دێت. (٣) جۆرە قالۆنچەیەکی ناو درەختە دەنگێکی لێوە دێت وەك چرکەی کاتژمێر لە کۆندا بە نیشانەی مردن دادەنرا.

**debacle** (dā-bä'k'l, di-bak''l), ***n.*** (١) توانەوەی سەهۆڵ لەناو رووباردا. (٢) لێشاوێکی ناو (بە قوڕو دارەوە). (٣) رووخان؛ بەزین؛ ژێرکەوتن.
(٤) کارەساتێکی کوتوپڕ.

**debar** (di-bär'), ***v.t.*** (١) لێ قەدەغەکردنی شتێك.
(٢) ماف لێ سەندنەوە؛ دەرکردن؛ رێگە پێ نەدان.

**debark** (di-bärk'), ***v.t.*** بارداگرتن لە پاپۆڕ.
***v.i.*** لە پاپۆڕ دابەزین و چوونە ناوشار.
**-debarkation *(n.)*.**

**debase** (di-bās'), ***v.t.*** سووك کردن؛ بایەخ کەمکردنەوە؛ نرخ شکاندن؛ پلەوپایە کەمکردنەوە؛ شکاندن.
**-debasement *(n.)*.**

**debatable** (di-bāt'ə-b'l), ***adj.*** (١) جێی گومانە؛ ناکۆکی لەسەرە.
(٢) دەشێت چەندوچۆنی لەسەر بکرێت یا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت.

**debate** (di-bāt'), ***v.t. & v.i.*** (١) لێکۆڵینەوە یا چەندوچۆن لەسەر کردن (ئەنجوومەن، کۆبوونەوەی پەرلەمان... هتد)؛ مشتومڕکردن.
(٢) بیرلێکردنەوە. (٣) [Obs.]، دەمەقاڵێ کردن؛ شەڕکردن؛ شەڕەقسەکردن.
***n.*** لێکۆڵینەوە؛ چەندوچۆن؛ بگرەوبەردە؛ گفتوگۆ.
**-debater *(n.)*.**

**debauch** (di-bôch'), ***v.t.*** رەوشت تێکدان؛ فێری سەرسەرێتی یا داوێن پیسی کردن
***v.i.*** رەوشت تێکچوون؛ سەرسەرێتی کردن؛ داوێن پیسی کردن.
***n.*** رەوشت خراپی و بەرەڵایی؛ سەرسەرێتی؛ داوێن پیسی.
**-debauchedly *(adv.)*; debauchment *(n.)*.**

**debauchee** (deb´ô-chē', deb´ô-shē'), ***n.*** کەسێکی سەرسەری.

**debauchery** (di-bôch'ēr-i), ***n.*** سەرسەرێتی؛ بەرەڵایی (رەوشت).

**debilitate** (di-bil'ə-tāt´), ***v.t.*** لاوازکردن (لەش)؛ تین لێ برین؛ بێ هێزکردن (تەندرووستی).
**-debilitation *(n.)*.**

**debility** (di-bil'ə-ti), ***n.*** لاوازی (لەش)؛ بێ هێزی (تەندرووستی)؛ بێ تینی؛ بێ ڕووزەیی.

**debit** (deb'it), ***n.*** قەرز؛ مایە یا دراوی لە حساب دەرکراو لە بانقدا.
***v.t.*** لە حساب دەرکردن (بانق)؛ قەرز خستنە سەر حسابی یەکێك لە بانقدا.

**debonair, debonaire** (deb´ə-nâr'), ***adj.*** (١) رەفتار جوان؛ رووخۆش؛ ناسك. (٢) شاد؛ بەختیار.

**debrief** (dē´brēf´), *v.t.* دەنگوباس وەرگرتن لە کاربەدەستێك کە تازە گەڕاپێتەوە لە جێبەجێکردنی ئەرکێك بەتایبەتی لە دەرەوەی وڵات بۆ کەلك وەرگرتن لەو دەنگوباسە.

**debris, dèbris** (də-brē´, dā´brē), *n.* (١) خاك‌وخۆڵ‌و پیسی‌و پاشماوەی شتومەکی شکاوو پەرش‌وبڵاو؛ پاشماوەی شتومەکی شکاوو دیمەنی دوای کارەساتێکی وەك لافاو، بوومەلەرزە، کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە... هتد. (٢) کۆمەڵە بەردی بەجێماو لە ڕووباری سەهۆڵبەنداندا (زەمینناسی).

**debt** (det), *n.* (١) قەرز (٢) ئەرکێکی سەرشان کە بە پێویستی دەزانێت بیکەیت (بۆ کەسێك، وڵات، یا مرۆڤایەتی). (٣) قەرزاری. (٤) گوناه (ئاین).

**get ( or run ) into debt,** قەرزاربوون

**in debt,** قەرزار

**debt of honor,** قەرزاریی ئەنجامی گرەو یا قومارکردن کە دانەوەی بەپێی یاسا پێویست نییە، بەڵام ناوخراپی لە دوا دەبێت ئەگەر نەدرێتەوە.

**debtor** (det´ẽr), *n.* قەرزار

**debunk** (di-buŋk´), *v.t.* [Colloq.], خستنەڕووی هیچ‌وپووچی‌و ساختەی شتێك یا کەسێك؛ هەڵماڵینی درۆودەلەسەو کەم‌وکووڕی.

**debut** (di-bū´, dā´bū), *n.* (١) خۆنواندنی ئەکتەرێك بۆ یەکەم جار لە شانۆگەرییەك یا فیلمێکدا. (٢) یەکەم جار هاتنەدەرەوەی کچێك بۆناو ئاهەنگو ناو کۆمەڵ (بەتایبەتی چینە بەرزەکانی کۆمەڵ). (٣) سەرەتای کار، پیشە، یا ئەرکێك؛ یەکەم جاری شتێك یا کردنی شتێك.

**debutant** (deb´yoo-tänt´, deb´yə-tant´), *n.* هونەرمەندێك یا ئەکتەرێك کە بۆ یەکەم جار لە شانۆگەرییەك یا لە فیلمێکدا بەشداری دەکات؛ کەسێکی تازە لە کارێکدا.

**debutante** (deb´yoo-tänt´, deb´yə-tant´), *n.* کچێك کە بۆ یەکەم جار دەچێتە دەرەوە بۆناو ئاهەنگو بۆناو کۆمەڵ (بەتایبەتی چینە–بەرزەکانی کۆمەڵ).

**Dec.**, = December.

**deca-** (dek´ə), *Also* dec- and deka-, پێشگرێکە بەمانای: دە: *( decameter)*

**decade** (dek´ād, de-kād´), *n.* دە ساڵ

**decadence** (di-kā´d'ns, dek´ə-dəns), *n.* ڕەووشت سووکی؛ سووکی؛ نەرمی؛ شیببوونەوە؛ بەرەو دواوە چوون‌و بەناخدا چوون (ژیار، کۆمەڵ، هونەر، وێژە، ڕەووشت).

**decadency** (di-kā´d'n-si, dek´ə-dən-si), *n.* = decadence.

**decadent** (di-kā´d'nt, dek´ə-dənt), *adj.* ڕەووشت سووك؛ سەرسەری؛ بەرەو دواوەو بەناخدا چوو (ژیار، کۆمەڵ، هونەر، وێژە... هتد).

***n.*** کەسێکی سەرسەری یا ڕەووشت سووك.

**decagon** (dek´ə-gon´), *n.* دەگۆشە؛ دەلا.

**decagram, decagramme** (dek´ə-gram´), *n.* دە گرام.

**decalcify** (dē-kal´sə-fī´), *v.t.* دەرهێنانی کالسیۆم لە ئێسقان.

**-decalcification** *(n.)*.

**decameter, decametre** (dek´ə-mē´tẽr), *n.* دە مەتر

**decamp** (di-kamp´), *v.i.* (١) چادرگا بەجێهێشتن؛ خۆدابڕین لە–ئۆردوگا (٢) ڕاکردن؛ خۆدابڕین لە کۆمەڵ بە نهێنی‌و لەپڕ.

**decant** (di-kant´), *v.t.* (١) ڕۆکردنی شلە لە دەفرێك بەئەسپایی‌و بەبێ جووڵاندنەوەی خڵتەی بنەکەی (٢) ڕۆکردنی شلە لە دەفرێکەوە بۆ–دەفرێکی تر.

**decanter** (di-kan´tẽr), *n.* سوراحی

**decapitate** (di-kap´ə-tāt´), *v.t.* سەربڕین (سزا)؛ سەرلێکردنەوە.

**-decapitation** *(n.)*; **decapitator** *(n.)*.

**decarbonate** (dē-kär´bə-nāt´), *v.t.* لێ لابردنی ئۆکسیدی کاربۆن

**-decarbonated** *(adj.)*.

**decarbonize** (dē-kär´bə-nīz´), *v.t.* کاربۆن لێ لابردن

**decasyllable** (dek´ə-sil´ə-b'l), *n.* دێرێکی هۆنراوەی دەبڕگەیی.

**-decasyllabic** *(adj.)*.

**decathlon** (di-kath´lon), *n.* پێشبڕکێیەکی دەجۆرییە ئەو کەسەی لە زۆربەی یارییەکاندا لەپێشەوە بێت پێشبڕکێکە دەباتەوە.

**decay** (di-kā´), *v.i.* (١) ڕزین؛ پووکانەوە؛ داوەشین؛ فەوتان. (٢) بۆگەن کردن؛ بۆن کردن؛ پیس بوون.

***v.t.*** ڕزاندن؛ پووکاندنەوە؛ داوەشاندن؛ بۆگەن پێکردن.

**decay** (di-kā´), *n.* (١) ڕزین؛ پووکانەوە؛ داوەشین؛ فەوتان. (٢) بۆگەن کردن؛ بۆن کردن؛ خراپ بوون. (٣) بۆگەنی؛ بۆگەنێتی.

**decease** (di-sēs´), *n.* مردن؛ کۆچی دوایی.

***v.i.*** مردن؛ کۆچی دوایی کردن.

**deceased** (di-sēst´), *adj.* مردوو: *( Her father is ~ .)*.

**the deceased,** (١) کەسە مردووەکە؛ خوالێخۆشبوو. (٢) مردووەکان.

**decedent** (di-sē´d'nt), *n.* مردووەکە (دادگەری).

**deceit** (di-sēt´), *n.* (١) فێڵ؛ درۆ؛ ساختە. (٢) فێڵبازی؛ درۆزنی؛ ناپاکی.

**deceitful** (di-sēt´fəl), *adj.* (١) ساختەچی؛ فێڵباز؛ ناپاك (٢) ساختە؛ درۆ؛ ناپاك.

**deceive** (di-sēv´), *v.t.* & *v.i.* خەڵەتاندن؛ بەهەڵەدابردن؛ فریودان.

**decelerate** (dē-sel´ẽr-āt´), *v.t.* & *v.i.* هێواش کردنەوە (خێرایی)؛ خاوبوونەوە؛ خاوکردنەوە.

**-decelerator** *(n.)*.

**deceleration** (dē-sel´ẽr-ā´shən), *n.* هێواش بوونەوە؛ خاوبوونەوە.

**December** (di-sem´bẽr), *n.* دیسەمبەر؛ دوا مانگی ساڵی زایینی.

**decency** (dē´s'n-si), *n.* (١) باشی (مرۆڤ)؛ چاکی؛ پیاوچاکی. (٢) ئابڕوو؛ حەیا؛ شەرم؛ ڕەووشت جوانی. (٣) *(pl.)*، کردەوەی کۆمەڵایەتی بەجێ‌و شیاو. (٤) *(pl.)*، پێویستی ژیان.

**decennial** (di-sen´i-əl), *adj.* دەساڵی؛ هەر دە ساڵ جارێك ڕوودەدات.

***n.*** یەرەوەری دە ساڵانە؛ یادی دە ساڵە.

**decent** (dē´s'nt), *adj.* (١) باش (مرۆڤ)؛ چاك (ڕەووشت)؛ پیاوچاك: *( ~ behavior; a ~ person)* (٢) بەحەیا؛ بەئابڕوو؛ داوێن پاك؛ ڕەووشت جوان. (٣) شیاو؛ گونجاو. (٤) بەڕێز؛ شایستەی ڕێزە. (٥) مام ناوەندی؛ باش (باری ژیان)؛ نە باش‌و نە خراپ؛ پەسەند: *( ~ wages)* (٦) [Colloq.]، جل‌وبەرگی پەسەندو ڕێك‌وپێکی لەبەردایە.

**deception** (di-sep´shən), *n.* (١) فروفێڵ کردن؛ دەستبڕین؛ فریودان. (٢) فێڵ؛ ساختە؛ درۆ. (٣) شتێکی ساختەو بەهەڵەدابەر.

**deceptive** (di-sep´tiv), *adj.* بەهەڵەدابەر؛ ساختە؛ فێڵباز؛ درۆزنە: *( Appearances are often ~ . ; a ~ person)*

**decide** (di-sīd´), *v.t.* & *v.i.* بڕیاردان؛ بڕینەوە.

**decided** (di-sīd´id), *adj.* (١) دیار؛ بێ گومان؛ یەکلایی: *( He won a ~ victory.)* (٢) سوور لەسەر؛ ڕانەگۆڕ.

**-decidedly** *(adv.)*.

**deciduous** (di-sij´ōō-əs, di-sij´ū-əs), *adj.* (١) کەوتوو لە کات یا وەرزێکی تایبەتیدا (گەڵا، ددان، باڵی مێروو، شاخی هەمەلەقی ئاسکەکێوی). (٢) گەڵای کەوتووی دار لە وەرزی زستاندا: *( ~ trees)*. (٣) سەردەمی؛ کاتی.

**decimal** (des´ə-m'l), *adj.* دەیی (بیرکاری).

***n.*** کەرتی دەیی.

**decimal fraction,** کەرتی دەیی.

**decimalize** (des´ə-m'l-īz´), *v.t.* گۆڕین بۆ پەیڕەوی دەیی

**decimal system,** پەیڕەوی دەیی

**decimate** (des´ə-māt´), *v.t.* (١) بە تیروپشك هەڵبژاردن‌و کوشتنی هەموو دەیەمین کەسێك. (٢) کوشتنی ژمارەیەکی زۆر؛ لاوازکردن؛ لەناوبردن؛

قەلاچۆکردن: ( *They ~d the enemy.* ) . (٣) فەوتاندن یا بردنی دەیەك.
**-decimation** *(n.)*; **decimator** *(n.)*.
**decimeter, decimetre** (des′ə-mē′tēr), *n.* دەسیمەتر: دەیەکی مەتر
**decipher** (di-sī′fēr), *v.t.* (١) هەڵهێنانی شفرە؛ خوێندنەوە یا دەرکردنی نووسراوی شفرە؛ دۆزینەوەی نهێنییەك.
(٢) دۆزینەوە یا دەرکردنی نووسراوێکی کۆن، کوژاوە، یا ناڕێکوپێك.
**decision** (di-sizh′ən), *n.* (١) بڕیار
(٢) بڕینەوە (دادگا)؛ بەلایەکدا خستن.
(٣) زەبر؛ دوودڵی نەکردن: ( *a man of ~* )
**decisive** (di-sī′siv), *adj.* (١) (ا) یەکلایی؛ تەواو؛ بێ چەندوچۆن: ( *a ~ victory* )
(ب) یەکلاکەرەوە؛ بەلایەکداخەر؛ زۆر گرنگ؛ بڕیاردەر: ( *a ~ battle* ) .
(٢) بەزەبر؛ دوودڵی نەکەر: ( *a ~ man* ) .
**deck** (dek), *n.* (١) سەر پشتی پاپۆڕ؛ زەمینەی پاپۆڕ.
(٢) (ا) زەمینە یا نهۆمی یەکەمی پاسی دوونهۆم.
(ب) سەربانێکی بچووك یا هەیوانێکی تەختە لە دەرەوە بۆ دانیشتن لەبەر هەتاو.
(٣) دەستە کاغەزی یاری یا قومارکردن.
*v.t.* (١) ڕازاندنەوە؛ پۆشین بە جلوبەرگ و خشڵی جوان.
(٢) دروستکردنی سەر پشتی پاپۆڕ. (٣) [Archaic]، داپۆشین.
**clear the decks,** (١) لابردنی شتی ناپێویست لەسەر پشتی پاپۆڕ (بۆ ئامادەبوون بۆ جەنگ). (٢) خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ یا ئەرکێك.
**on deck,** [Colloq.], (١) ئامادە.
(٢) ئامادەیە نۆرەی خۆی بکات یا وەرگرێت لە یارییەکدا.
**deck chair,** کورسی نووشتاوە (سەر پشتی پاپۆڕ، هەیوانی ماڵ).
**deck hand,** کرێکاری سەر پشتی پاپۆڕ (بۆ پاککردنەوەو کاری تری وەها).
**declaim** (di-klām′), *v.i.* (١) ووتار خوێندنەوە؛ ووتاردان.
(٢) ( ~ against )، هێرش بردنە سەر لە ووتاردا.
**declamation** (dek′lə-mā′shən), *n.* (١) ووتار خوێندنەوە؛ ووتاردان؛ هونەری ووتاردان. (٢) ووتار؛ هەڵبەستێکی خوێنراوە بە دەنگی بەرز.
(٣) ووتارێکی بەجۆش و بە دەنگی بەرز وتراو.
**-declamatory** *(adj.)*.
**declaration** (dek′lə-rā′shən), *n.* (١) جاڕدان؛ بلاوکردنەوە؛ بانگدان؛ ئاشکراکردن؛ ووتن. (٢) بلاوکراوە؛ بلاوکراوەیەك.
(٣) بلاوکراوەیەکی ڕەسمی: ( *the ~ of a nation's independence* ) .
(٤) خستنەڕووی دەسکەوت یا شتومەکی باج لەسەر (گومرگ، باجی دەرامەت): ( *a ~ at the customs office* )
(٥) (ا) بلاونامەی داواچی دەربارەی هۆی داواکردنەکەی (دادگا).
(ب) گەواهنامە
**Declaration of Independence,** بانگی سەربەخۆیی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (٤ ی تەمموزی ١٧٧٦).
**declarative** (di-klar′ə-tiv), *adj.* تایبەتی بە بانگ بۆ دان، ووتن، یا بلاوکردنەوە: ( *a ~ sentence* ) .
**-declaratory** *(adj.)*.
**declare** (di-klâr′), *v.t.* (١) جاڕدان؛ بلاوکردنەوە؛ بانگدان.
(٢) ئاشکراکردن؛ پیشاندان. (٣) بەدڵ ووتن.
(٤) خستنەڕووی دەسکەوت یا شتومەك بۆ باجدان (گومرگ، باجی دەسکەوت).
*v.i.* (١) بلاوکردنەوە. (٢) (ا) ( ~ for )، لایەنگرتن؛ پاڵپشتی کردن.
(ب) ( ~ against )، دژ وەستان.
**declare oneself,** (١) بیروڕای خۆ دەربڕین.
(٢) ڕاستی خۆ ئاشکراکردن؛ خۆ ساغ کردنەوە.
**I declare!** زۆر سەرسامە! سەرم سووڕ دەمێنێت!
**declassify** (dē-klas′ə-fī′), *v.t.* لابردنی قەدەغەیی ڕاپۆرت و بەڵگەنامەی نهێنی فەرمانڕەوایی و ڕێگەدان بە گەل بۆ بینینیان.
**declension** (di-klen′shən), *n.* (١) لاربوونەوە؛ بەرەوخواربوونەوە؛ هاتنەخوارەوە. (٢) نشوستی هێنان؛ کزبوون؛ بەرەو نەمان چوون؛ دواکەوتن
(٣) لادان لە ڕێگە یا ئاینی ڕاست. (٤) [Rare]، نەویستن؛ قایل نەبوون.
(٥) گۆڕانی کۆتایی ناو و ڕاناو و ناوەڵناو لە ڕستەدا (ڕێزمان):
**( ship → ships ; ships → ship's ; you → your)**
**declensional** (di-klen′shən-′l), *adj.* تایبەتی بە گۆڕانی کۆتایی ناو و ڕاناو و ناوەڵناو (وشەی پێشوو ببینە).
**declinable** (di-klī′nə-b′l), *adj.* کۆتاییەکەی دەگۆڕێت: ناو، ڕاناو، ناوەڵناو (وشەی پێشووتر ببینە).
**declination** (dek′lə-nā′shən), *n.* (١) لاربوونەوە؛ خواربوونەوە.
(٢) لاربوونی گۆشەیی دەرزی ڕانوما لە باکوور و باشووری ڕاستەقینە.
(٣) دووری گۆشەیی ئەستێرە لە هێڵی یەکسانەوە.
(٤) نەویستن؛ قایل نەبوون.
**decline** (di-klīn′), *v.i.* (١) لاربوونەوە؛ بەرەوخواربوونەوە؛ دانەوین.
(٢) ئاوابوون (ڕۆژ)؛ بەئاخداچوون؛ داچوون.
(٣) بەرەو نەمان چوون؛ نشوستی هێنان؛ فەوتان: ( *the ~ of the empire* ) .
(٤) نەویستن یا قایل نەبوون.
*v.t.* (١) لارکردنەوە؛ خوارکردنەوە؛ دانەواندن.
(٢) نەویستن یا قایل نەبوون: ( *I must ~ your invitation.* ) .
(٣) گۆڕینی کۆتایی ناو و ڕاناو و ناوەڵناو (ڕێزمان).
*n.* (١) کزبوون؛ نەمان؛ فەوتان؛ بەرەو دواوە هاتن.
(٢) بەرەو خراپی چوون (تەندروستی).
(٣) سەردەمی نشوستی، کزبوون، یا لاوازی.
(٤) بەشی کۆتایی؛ کۆتایی: ( *the ~ of life* ) .
(٥) نەخۆشی داڕزێنەر یا پووکێنەرەوە (دەردەباریکە).
(٦) بەرەوخوارکە؛ لێژی؛ سەرەوخوارکە.
**declivity** (di-kliv′ə-ti), *n.* بەرەوخوارکە؛ سەربەرەوخوارکە؛ لێژایی.
**decoct** (di-kokt′), *v.t.* تام لێ دەرهێنانی خواردەمەنی بە کوڵاندنی.
**-decoction** *(n.)*.
**decode** (dē-kōd′), *v.t.* هەڵهێنانی شفرە؛ خوێندنەوەی شفرە؛ دەرکردنی شتێکی بە شفرە نووسراو.
**decoder** (dē-kōd′ēr), *n.* (١) هەڵهێنەری شفرە (مرۆڤ).
(٢) ئامێری هەڵهێنانی شفرە.
**decolor** (dē-kul′ēr), *v.t.* ڕەنگ لێ لابردن.
**decolorize** (dē-kul′ēr-īz′), *v.t.* = **decolor.**
**-decolorization** *(n.)*; **decolorizer** *(n.)*.
**decompose** (dē′kəm-pōz′), *v.t. & v.i.* (١) داوەشاندن؛ داوەشین؛ داڕزاندن؛ داڕزین: ( *The body has ~d.* ) .
(٢) بۆن کردن؛ بۆگەن کردن.
**decomposition** (dē′kom-pə-zish′ən), *n.* (١) داوەشین؛ داڕزین. (٢) بۆن کردن؛ بۆگەن کردن.
**decompress** (dē′kəm-pres′), *v.t.* لابردنی پەستان؛ کەمکردنەوەی پەستان.
**decompression** (dē′kəm-presh′ən), *n.* (١) پەستان نەمان؛ پەستان لابردن. (٢) نەشتەرگەرییەك بۆ لابردنی پەستان لەسەر ئەندامێکی لەش یا مێشك.
**decontaminate** (dē′kən-tam′ə-nāt′), *v.t.* پاککردنەوە؛ لابردنی شتی پیس (وەك گازی ژەهراوی).
**-decontamination** *(n.)*.
**decontrol** (dē′kən-trōl′), *v.t.* جڵەوبەردان؛ ڕێ بۆ بەرەڵاکردن.
*n.* بێ جڵەوی؛ ڕێ بەرەڵایی؛ بێ دابینی.
**décor** (dā-kôr′), *n.* (١) ڕازاندنەوە.
(٢) دیکۆر؛ نەخشەو شێوازی ڕازاندنەوەی ماڵ، شانۆ، فەرمانگا ... هتد.
**decorate** (dek′ə-rāt′), *v.t.* (١) ڕازاندنەوە؛ نەخش و نیگارکردن؛ پووکەش کردن: ( *to ~ a room* ) .
(٢) مەدالیا پێدان بۆ ئازایی یا کارێکی قورس و گرنگ.

*( He was ~d for heroism.)*
**decoration** (dek´ə-rā′shən), *n.* (۱) ڕازاندنەوە؛ نەخشاندن.
(۲) نەخش‌ونیگار؛ ئارایشت؛ شتی ڕازێنەرەوە
(۳) نیشان (بۆ لێهاتوویی و ئازایی)؛ مەدالیا.
**decorative** (dek′ə-rā´tiv, dek′ə-rə-tiv), *adj.* ڕازێنەرەوە؛
تەنها بۆ ڕازاندنەوەو ڕووکەش کردنە.
**decorator** (dek′ə-rā´tēr), *n.* ڕازێنەرەوە؛ نەخشێنەر؛ کەسێکە کە
پیشەی نەخشاندن‌و ڕازاندنەوەی ناومال، خانوو، فرۆشگا... هتد
**decorous** (dek′ə-rəs, di-kôr′əs, di-kō′rəs), *adj.* شیاو؛
جوان‌و ڕێک‌وپێک؛ لە سنووری سەلاری‌و ڕەووشت جوانیدایە
**decorum** (di-kôr′əm, di-kō′rəm), *n.* ڕێک‌وپێکی و جوانی-
ڕەفتار (جل‌وبەرگ)؛ حەیاو شەرم؛ سەلاری: *( to behave with ~ )*.
**decoy** (di-koi′), *n.* (۱) داو؛ تەڵە
(۲) باڵندەیەکە (ڕاستەقینە یا دەستکرد) کە دەکرێت بە داو بۆ ڕاوکردنی
باڵندەی تر (وەک لە ڕاوە کەو و سوێسکەدا)
(۳) کەسێک یا شتێکە کە دەکرێت بە داو بۆ گرتنی ئەوانەی کاری قەدەغە دەکەن:
*( a police ~ )*
*v.t. & v.i.* تەڵە یا داو بۆ نانەوە
**decrease** (di-krēs′, dē-krēs′), *v.t. & v.i.* کەم بوونەوە؛
کەمکردنەوە
*n.* کەم بوونەوە
**decree** (di-krē′), *n.* (۱) فەرمان؛ فەرمانی میری؛ فەرمانی شاهانە؛
فەرمانی کلێسە (۲) بڕیارێک کە گۆڕینی بۆ نییە: *( a ~ of fate)*.
*v.t. & v.i.* فەرمان دەرکردن؛ فەرمان کردن.
**decrepit** (di-krep′it), *adj.* پەککەوتە؛ کەفتەکار؛ کۆن‌و پەڕیووت.
*( a ~ man ; a ~ house)*
-decrepitude *(n.)*.
**decrescent** (di-kres′'nt), *adj.* لە کەم بوونەوەدایە؛
لە بچووک بوونەوەدایە (مانگ)
**decry** (di-krī′), *v.t.* (۱) ناڕەزایی دەربڕین بەتوندی؛ سەرزەنشت کردن:
*( we ~ religious intolerance.)*
(۲) نرخ شکاندن (دراو)؛ لە بایەخ کەمکردنەوە؛ شکاندن؛ سووک کردن.
**decumbent** (di-kum′bənt), *adj.* (۱) ڕاکشاو؛ پاڵکەوتوو.
(۲) تەڕفرێندەر بەسەر زەویدا (ڕووەک).
**decuple** (dek′yoo-p'l), *adj.* (۱) دە ئەوەندە. (۲) دە دە
*n.* ژمارەیەک کە دە ئەوەندەی ژمارەیەکی تر بێت.
*v.t.* دە ئەوەندە کردن؛ دە جار گەورەکردن (ژمارە، هەند).
**decussate** (di-kus′āt), *v.t. & v.i.* بە ڕاست‌و چەپ لەیەکدان
*adj.* (۱) لەیەکدراو ڕاست‌و چەپ
(۲) بە شێوەیەک دەرهاتوون کە بە ڕاست‌و چەپ لەیەکتری بدەن (گەڵا، لق):
*( ~ leaves)*
**dedicate** (ded′ə-kāt´), *v.t.* (۱) تەرخان کردن؛ بەخت کردن:
*( He ~d his life to the service of his country.)*
(۲) پێشکەش کردن؛ بەخشین (پەڕتووک، هەڵبەست، بەرهەمی هونەری):
*( He ~d his book to his parents.)*
(۳) کردنەوە بە ڕەسمی (خانوو، پرد، پرۆژە، پیشانگا... هتد):
*( to ~ a building, water project, etc.)*
(٤) تەرخان کردنی زەوی بۆ بەکارهێنانی گشتی
**dedicated** (ded′ə-kāt´id), *adj.* دڵسۆز؛ لێبوردوو؛ خۆتەرخانکەر؛
خۆبەختکەر
**dedication** (ded´ə-kā′shən), *n.* (۱) تەرخان کردن؛ بەخت کردن.
(۲) دڵسۆزی؛ خۆ بەخت کردن. (۳) بە ڕەسمی کردنەوە.
(٤) پێشکەش کردن؛ وتەی پێشکەش کردنی پەڕتووک یا هەڵبەستێک لە
سەرەتای پەڕتووکەکەدا.
**deduce** (di-dōōs′, di-dus′), *v.t.* بۆ دەرکەوتن؛ گەیشتنە ئەو
ئەنجامە: *( If you see a doctor leaving a house, you may ~ the fact that someone in the house is ill.)*
-deducible *(adj.)*.
**deduct** (di-dukt′), *v.t.* لێ داشکاندن؛ لێ دەرکردن.
**deductible** (di-duk′tə-b'l), *adj.* لێی دادەشکێنرێت؛
لێی دەردەکرێت (باجی دەسکەوت): *( tax- ~ contributions)*
**deduction** (di-duk′shən), *n.* (۱) داشکاندن؛ دەرکردن.
(۲) (ا) بۆ دەرکەوتن؛ دۆزینەوە؛ ئەنجام کردن. (ب) دەرئەنجام.
**deductive** (di-duk′tiv), *adj.* تایبەتی بە گەیشتنە ئەو ئەنجامە
یا بۆ دەرکەوتن لەڕێی بیرکردنەوەوە: *( ~ reasoning)*.
-deductively *(adv.)*.
**deed** (dēd), *n.* (۱) کردار؛ کردەوە؛ کار. (۲) شاکار؛ کارێکی گرنگ یا
ئازایانە. (۳) قەواڵە؛ تاپۆ؛ موڵکنامە.
in deed, لەڕاستیدا؛ بەڕاستی.
**deem** (dēm), *v.t. & v.i.* وادانان؛ وازانین؛ وا بڕوابوون
**deep** (dēp), *adj.* (۱) قووڵ.
(۲) قووڵاییەکی تایبەتی *( eight feet ~ )*.
(۳) لە بنی بنەوە. (٤) بەجۆش؛ قووڵ: *( ~ love)*
(٥) تێگەیشتوو؛ قووڵ *( a ~ person)*
(٦) فێڵباز؛ ساختەچی.
(۷) ( ~ in )، لە بیرکردنەوەیەکی قووڵدایە: *( He's ~ in thought.)*.
(۸) قووڵ: *( a ~ sleep)*. (۹) تۆخ؛ تێر (ڕەنگ): *( ~ colors)*.
(۱۰) تێکەوتوو: *( ~ in debt)*. (۱۱) نزم‌و گڕو پڕ (دەنگ): *( a ~ voice)*
*n.* (۱) شوێنێکی قووڵ (ئاو، زەوی).
(۲) ناوەڕاست؛ نیوەشەو؛ تاریکترین‌و بێ دەنگ ترین بەشی شتێک.
*( in the ~ of night)*
*adv.* بە قووڵی؛ نێچگار لە بنەوە یا لە دواوە.
go off the deep end, (۱) خۆ فڕێدانە ناو ئاوی قووڵەوە.
(۲) [Colloq.]، بە هەڵەشەیی خۆ فڕێدانە کارێکەوە.
(۳) [Colloq.]، تووڕەبوون؛ هاتنە جۆش.
the deep, [Poetic], دەریا.
**deep-dyed** (dēp′dīd′), *adj.* (۱) هەمووی ڕەنگی گرتووە؛
باش لە خوم دراوە. (۲) تەواو: *( a ~ villain)*.
**deepen** (dēp′'n), *v.t. & v.i.* قووڵ کردن؛ قووڵ بوون.
**deepfreeze** (dēp′frēz′), *n.* بەفرخەرێکی زۆر سارد.
*v.t.* شتومەک خستنە ناو بەفرخەرێکی زۆر ساردەوە.
**deep-fry** (dēp′frī′), *v.t.* سوورکردنەوە لەناو تاوە یا مەنجەڵێکی
پڕ لە ڕۆنی گەرمدا.
**deep-rooted** (dēp′rōōt′id, dēp′root′id), *adj.* ڕەگ داکوتاو؛
ڕەگ قووڵ؛ قووڵ؛ کۆن: *( ~ prejudice)*
**deep-sea** (dēp′sē′), *adj.* لە قووڵایی دەریادا؛ لە بەشە قووڵەکانی
دەریادا: *( ~ fishing)*.
**deep-seated** (dēp′sēt′id), *adj.* ڕەگ قووڵ؛ چەسپیو؛ کۆن:
*( ~ hatred; ~ traditions)*
**deer** (dêr), *n.* ئاسک؛ ئاسکە کێوی.
**deerskin** (dêr′skin´), *n.* (۱) پێستەی ئاسک.
(۲) چەرمی پێستەی ئاسک.
**deface** (di-fās′), *v.t.* (۱) شێواندن‌و لەکەدارکردنی ڕووی شتێک؛
تێکدان‌و پیس کردن‌و ناشرین کردنی ڕووکار. (۲) کوژاندنەوە.
-defacement *(n.)*.
**defamation** (def´ə-mā′shən, dē´fə-mā′shən), *n.* بوختان؛
ناوپیس کردن؛ ئەتک.
-defamatory *(adj.)*.
**defame** (di-fām′), *v.t.* ناو پیس کردن؛ بوختان کردن؛ ئەتک کردن.
**default** (di-fôlt′), *n.* (۱) دواکەوتن لە کردنی شتێک لە کاتی خۆیدا؛

نەچوون بۆ شوێنێك وەك پێویست بوو: *( They lost the game by ~ .)* .
(۲) قەرز نەدانەوە لە کاتی خۆیدا یا دواکەوتن لە دانەوەیدا.
(۳) نەچوون بۆ دادگا لە ڕۆژی دیاریکراودا (داواچی یا داوا لەسەر کراو).
*v.i. & v.t.* (۱) نەکردنی شتێك وەك پێویست بوو.
(۲) قەرز نەدانەوە لە کاتی خۆیدا: *( He ~ed on the debt.)* .
(۳) نەچوون بۆ دادگا لە کاتی دیاریکراودا
(٤) بەشدار نەبوون لە پێشبڕکێیەکدا. (٥) دۆڕاندن لەبەر ئامادە نەبوون.
**in default of,** لەبەر نەبوون؛ بەهۆی ئامادە نەبوون.
**judgment by default,** بردنەوەی داوایەك لە دادگادا لەبەر نەهاتنی لایەك بۆ دادگا.
**to win by default,** بردنەوەی پێشبڕکێیەك بەهۆی بەشدار نەبوونی تیپی بەرامبەر
**defaulter** (di-fôl′tēr), *n.* (۱) دواکەوتوو لە ئەرکی پێویست.
(۲) دزی پارەی پێ سپێردراو.
**defeat** (di-fēt′), *v.t.* بەزاندن؛ شکاندن (جەنگ)؛ بەسەردا سەرکەوتن (جەنگ، بوربۆڕێن)؛ ژێرخستن.
*n.* بەزین؛ شکان؛ ژێرکەوتن؛ دۆڕاندن
**defeatism** (di-fēt′iz′m), *n.* گیانی بەزین و کۆڵدان؛ زوو وازهێنان یا کۆڵدان
**defeatist** (di-fēt′ist), *n.* کەسێکی بەزیو یا کۆڵدەر.
**defecate** (def′ə-kāt′), *v.t.* پاککردنەوە؛ خڵتە دەرهێنان (شەراب، ئاو... هتد)
*v.i.* پیسایی کردن؛ گووکردن.
**-defecation** *(n.).*
**defect** (di-fekt′, dē′fekt), *n.* (۱) ئەنگی؛ ناتەواوی؛ کەموکورتی.
(۲) خەوش؛ ناتەواوییەك؛ ئەنگ.
*v.i.* پەنابردنە بەر دوژمن؛ هەڵهاتن و چوونە پاڵ دوژمن.
**defection** (di-fek′shən), *n.* (۱) ئەنگی؛ ناتەواوی؛ کەموکورتی؛ خەوش (۲) پەنابردنە بەر دوژمن؛ هەڵهاتن و چوونە پاڵ دوژمن
**defective** (di-fek′tiv), *adj.* (۱) ناتەواو (کەلوپەل، ئامێر)؛ خراپ (شتومەك)؛ کەموکورتی هەیە؛ عەیبەدار.
(۲) هەموو شێوەکانی گەردان کردنی نییە (کردار- ڕێزمان):
*( Ought* is a ~ verb.)
(۳) ناتەواو (لەش یا مێشك).
*n.* (۱) کەسێکی ناتەواو لەڕووی لەش یا مێشکەوە
(۲) وشەیەکی ناتەواو، واتە هەموو شێوەکانی گەردان کردنی نەبێت (ڕێزمان).
**defence** (di-fens′), *n.* = defense; [British Spelling].
**defend** (di-fend′), *v.t.* (۱) پاراستن؛ بەرگری کردن.
*( They ~ed the city against the enemy.)*
(۲) بە ڕەوا پیشاندان؛ بەڵگە بۆ هێنانەوە: *( He ~ed his conduct.)* .
(۳) پاڵپشتی کردن؛ لەسەرکردنەوە
(٤) پارێزگاری کردنی داوا لەسەر کراو (دادگا)
*v.i.* پارێزگاری کردنی داوا لەسەر کراو (دادگا).
**defendant** (di-fen′dənt), *n.* داوا لەسەر کراو؛ گومانبار
*adj.* تایبەتی بە پاراستن یا پارێزگاری کردن.
**defender** (di-fen′dēr), *n.* پارێزەر؛ بەرگریکەر.
**defense** (di-fens′), *n.* (۱) پاراستن؛ بەرگری؛ پارێزگاری
(۲) سەنگەر؛ قەڵا؛ هۆی پاراستن. (۳) پاڵپشتی؛ بەڵگە.
(٤) خۆ پاراستن (بە مستەکۆڵە). (٥) بەرەی بەرگری.
(٦) (أ) بەڵگەی داوا لەسەرو پارێزەرەکەی (دادگا).
(ب) داوا لەسەرو پارێزەر یا پارێزەرەکان
**defenseless** (di-fens′lis), *adj.* دەست بەستراو؛ بێ چەك؛ بێ پاڵپشت؛ بێ پارێزگاری: *( They attacked a ~ people.)* .
**defense mechanism (or reaction),** خۆپاراستن (بە دەست یا بە کردارو خووی دەروونی)

**defensible** (di-fen′sə-b′l), *adj.* (۱) دەپارێزرێت؛ دەتوانرێ پارێزگاری بکرێت (۲) ڕەوا؛ بە بەڵگە.
**defensive** (di-fen′siv), *adj.* (۱) بۆ پاراستنە نەك هێرش کردن؛ تایبەتی بە بەرگری کردن. (۲) تایبەتی بە خۆپاراستن (بەتایبەتی لە هێرشێکی نەبوو یا درۆ): *( She has a very ~ attitude.)* .
*n.* هەڵوێستی پارێزگاری.
**defer** (di-fûr′), *v.t. & v.i.* دواخستن بۆ دواڕۆژ (قەرز دانەوە، کار، سەربازگری... هتد)
**defer** (di-fûr′), *v.i.* ملدان (لەڕووی ڕێزەوە)؛ دڵ ڕاگرتن؛ بەقسەکردن:
*( He always ~s to his father's decisions.)*
**deference** (def′ēr-əns), *n.* ملدان (لەڕووی ڕێزەوە)؛ دڵ ڕاگرتن؛ بەقسەکردن.
in deference to, لەبەر خواستی کەسێك؛ لەبەر خاتری
**deferential** (def′ēr-en′shəl), *adj.* ڕێزگر؛ ملدەر.
**deferment** (di-fûr′mənt), *n.* دواخستن بۆ دواڕۆژ (قەرزدانەوە، کار، سەربازگری... هتد).
**deferred** (di-fûrd′), *adj.* (۱) دواخراو بۆ دواڕۆژ.
(۲) قازانج وەرگرتن یا قەرزدانەوە دواخراو.
(۳) دواخراو لە سەربازگری.
**defiance** (di-fī′əns), *n.* بەرەو ڕوو وەستان؛ بەرهەڵستی کردن؛ هەڵگەڕانەوە.
in defiance of, بەرامبەر بە (مەترسییەك)؛ بەرەو ڕوو وەستان
**defiant** (di-fī′ənt), *adj.* بەرەو ڕوو وەستاو؛ بەربەرەکانیکەر؛ هەڵگەڕاوە
**deficiency** (di-fish′ən-si), *n.* (۱) ناتەواوی؛ کەموکورتی.
(۲) (*pl.*)، کەمی؛ نەبوون.
**deficient** (di-fish′ənt), *adj.* (۱) ناتەواو؛ کەموکورت؛ عەیبەدار.
(۲) کەم (چۆنێتی، چەندی، پلە)؛ بەش ناکات
*n.* کەسێك یا شتێکی ناتەواو و کەموکورت.
**deficit** (def′ə-sit), *n.* ناتەواوی؛ کورت هێنان (بوودجە)؛ کەمی:
*( budget ~ )*
**defile** (di-fīl′), *v.t.* (۱) پیس کردن
(۲) گڵاوکردن (پەرستگا): *( to ~ a temple)* .
(۳) ڕەووشت خراپ کردن. (٤) ناو پیس کردن؛ ناوبانگ شکاندن
(٥) دەست بۆ ناموس بردن؛ بێ بن کردن.
**-defilement** *(n.)*; **defiler** *(n.)*; **defilingly** *(adv.).*
**defile** (di-fīl′, dē′fīl), *v.i.* بە ڕیز ڕۆیشتن.
*n.* (۱) چەم، دەربەند، یا ڕێگەیەکی تەسك کە دەبێت سەرباز بە یەك ڕیز پیایدا بڕۆن. (۲) چەم یا دەربەندێکی تەسك.
(۳) بە یەك ڕیز یا چەند ڕیزێك ڕۆیشتن.
**define** (di-fīn′), *v.t.* (۱) پێ ناسین؛ ناساندن: *( to ~ a word)* .
(۲) دیاری کردن؛ سنوور بۆ دانان.
**definite** (def′ə-nit), *adj.* (۱) دیاریکراو؛ سنووردار.
(۲) ڕاست و ڕەوان؛ ڕوون
(۳) مسۆگەر؛ بێ گومان: *( It's ~ that he'll go.)* .
(٤) تایبەتی؛ ئامرازی تایبەتی (ڕێزمان): ( "the" is a ~ article.)
-definiteness *(n.).*
**definite article,** ئامرازی پێناس، تایبەتیکەر، یا دیاریکەر وەك: " the " (ڕێزمان).
**definition** (def′ə-nish′ən), *n.* (۱) پێناسە؛ پێناس؛ پێناسین:
*( the ~ of a concept; word ~s)*
(۲) دیاری کردن؛ سنووردانان.
(۳) دیاری کردنی شتێك بە ووردبین
(٤) پلەی ڕوونی دەنگ و وێنە (رادیۆ، تەلەفزیۆن).
**definitive** (di-fin′ə-tiv), *adj.* (۱) کۆتایی پێ هێنەر؛ کۆتایی:

*( a ~ answer)*
(٢) راسترین و تەواوترین؛ هەرە ڕاست و تەواو:
*( a ~ dictionary; a ~ edition of Shakespeare)*
(٣) دیاریکەر؛ سنووردانەر (٤) بە تەواوی گەورەبوو (زیندەوەرزانی).
*n.* وشەی دیاریکەر یا پێناسین (ڕێزمان)، وەك:
**( this, that, any, some )**
**definitude** (di-fin′ə-tōōd′, di-fin′ə-tūd′), *n.* ووردی؛ تەواوی؛ بێ چەندوچۆنی.
**deflagrate** (def′lə-grāt′), *v.t. & v.i.* سووتان بە مەشخەڵانی ئاگر بە پەلەو کوتوپڕ.
**deflate** (di-flāt′), *v.t. & v.i.* (١) فش کردنەوە؛ فش بوونەوە؛ هەوا لێ دەرهێنان؛ هەوا لێ دەرهاتن: *( to ~ a tire)* .
(٢) بێ بایەخ کردن؛ شکاندن (مرۆڤ)؛ نرخ کەمکردنەوە.
**deflation** (di-flā′shən), *n.* (١) فش بوونەوە؛ فش کردنەوە.
(٢) چوونەوەخۆ (ئابووری)؛ چوونەوەیەك؛ کەمی پارە لە بازاڕدا بەهۆی بەرزبوونەوەی بەهای پارەو شکانی نرخی شتومەك.
**deflect** (di-flekt′), *v.t.* لادان؛ پێچکردنەوە؛ وەرگێڕان؛ شکاندنەوە؛ وەرچەرخاندن.
*v.i.* وەرگەڕان؛ پێچکردنەوە؛ لادان؛ شکانەوە؛ وەرچەرخان:
*( The bullet struck a wall and was ~ed from its course.)*
**-deflective *(adj.)*; deflector *(n.).***
**deflection** (di-flek′shən), *n.* شکانەوە؛ وەرچەرخان؛ لادان؛ وەرگەڕان.
**defloration** (def′lə-rā′shən), *n.* (١) گوڵ لێکردنەوە
(٢) بێ بن کردن؛ کچ کونکردن.
**deflower** (di-flou′ēr), *v.t.* (١) بێ بن کردن؛ کچ کونکردن.
(٢) گوڵ لێکردنەوە. (٣) وێرانکردن؛ خراپ کردن؛ پیس کردن.
**defoliant** (di-fō′li-ənt), *n.* ماددەیەکی کیمیاییە داروودرەختی پێ گەڵا ڕووت دەکرێت.
**defoliate** (di-fō′li-āt′), *v.t.* داروودرەخت ڕووتکردن؛ گەڵا لێکردنەوە.
**-defoliation *(n.).***
**deforest** (dē-fôr′ist, dē-for′ist), *v.t.* دارستان بڕین؛ پاکردنەوەی ناوچەیەك لە داروودرەخت؛ ڕووتکردن لە داروودرەخت.
**-deforestation *(n.).***
**deform** (di-fôrm′), *v.t.* (١) شێوە تێکدان؛ ڕووخسار شێواندن؛ شێواندن؛ خوارووخێچ کردن (٢) ناشرین کردن.
*v.i.* شێوە تێکچوون؛ ڕووخسار شێوان؛ ناشرین بوون.
**-deformation *(n.).***
**deformed** (di-fôrmd′), *adj.* (١) شێوە تێکچوو؛ ڕووخسار شێواو؛ خوارووخێچ و گێر. (٢) ناشرین.
**deformity** (di-fôr′mə-ti), *n.* (١) شێوە تێکچوون؛ ڕووخسار شێوان.
(٢) خوارووخێچی‌یەك؛ شێوە تێکچوونێك.
(٣) ئەندامێکی خوارووخێچ یا شێوە تێکچووی لەش. (٤) ناشرینی.
(٥) کەسێك یا شتێکی شێوە تێکچوو.
**defraud** (di-frôd′), *v.t.* بە ساختە لە دەست دەرکردن (سامان)؛ هەڵخەڵەتاندن و لێ کێشانەوە
**defray** (di-frā′), *v.t.* پارەی شتێك دان (گەشت، ئاهەنگ)؛ گرتنە ئەستۆی تێچوونی شتێك: *( to ~ the cost of a trip)* .
**-defrayal *(n.)*; defrayment *(n.).***
**defrock** (dē-frok′), *v.t.* لە قەشەیی لابردن؛ دەرکردن لە قەشەیی؛ بەرگی قەشەیی لێ سەندنەوە
**defrost** (dē-frôst′, dē-frost′), *v.t.* خاوکردنەوە (خواردەمەنی)؛ بەفر یا سەهۆڵ لێ لابردن (بەفرخەر، باڵی فڕۆکە)؛ تەم لابردن (لە دیوی ناوەوەی شووشەی ئوتومبیل).
*v.i.* بەفر یا سەهۆڵ پێوە نەمان؛ خاوبوونەوە.
**defroster** (dē-frôs′tēr, dē-fros′tēr), *n.* سەهۆڵ لابەر یا توێنەرەوە: ئامێرێکی گەرمادەرە بۆ تواندنەوەی سەهۆڵ یا هەر نەهێشتنی دروست بوونی سەهۆڵ؛ تەم لابەر لەسەر شووشەی ئوتومبیل
**deft** (deft), *adj.* کارامە؛ سەردەرچوو؛ لێهاتوو (کاری دەستی).
**defunct** (di-fuŋkt′), *adj.* نەماو؛ مردوو؛ هەڵوەشێنراو:
*( a ~ company or organization)*
**defuse** (di-fūz′), *v.t.* (١) لەکارخستن؛ پووچەڵ کردنەوە (بۆمبا، مین)؛ پەکخستن؛ ڕەواندنەوە (٢) هێمن کردنەوەی بارێکی ئاڵۆز:
*( He was able to ~ the situation.)*
**defy** (di-fī′), *v.t.* (١) بەرهەڵستی کردن؛ بەربەرەکانی کردن؛ بەرەو ڕوو وەستان. (٢) بە کەسێك وتن: " ئەمە ئەرزو ئەمە گەز "
**degeneracy** (di-jen′ēr-ə-si), *n.* (١) نزمی (ڕەووشت)؛ سووکی؛ سەرسەرێتی. (٢) داوەشین؛ ڕزین؛ بۆگەن کردن؛ شیبوونەوە.
**degenerate** (di-jen′ēr-it), *adj.* نزم (ڕەووشت)؛ سووك؛ سەرسەری؛ بێ نامووس؛ بەرەو خراپی ڕۆیشتوو.
*n.* کەسێکی نزم (ڕەووشت، توانای مێشك)؛ کەسێکی سووك یا سەرسەری؛ کەسێکی بێ نامووس
*v.i.* (١) خۆ سووك کردن یا نزم کردنەوە؛ سووك بوون؛ دانە دواوە
(٢) بەناخداچوون (زیندەوەرزانی).
**-degenerative *(adj.).***
**degeneration** (di-jen′ēr-ā′shən, de′jen-ēr-ā′shən), *n.*
(١) نزمی؛ سووکی؛ بێ نامووسی؛ سەرسەرێتی.
(٢) بەناخداچوون (زیندەوەرزانی).
(٣) شیبوونەوە (تێشووی لەش یا ڕووەك)؛ لەکارکەوتنی ئەندامی زیندەوەر (بەهۆی نەخۆشی یا بریندارییەوە).
**degradation** (deg′rə-dā′shən), *n.* (١) لە پلەوپایە نزم بوونەوە؛ لێ سەندنەوەی پلەو ڕێز. (٢) سووکی؛ نزمی؛ نزم بوونەوە.
(٣) بایەخ شکان. (٤) شەرمەزاری؛ ئابڕووچوون
(٥) خورانەوە؛ داخوران (زەمینناسی).
**degrade** (di-grād′), *v.t.* (١) لە پلەوپایە کەمکردنەوە.
(٢) سووك کردن؛ نزم کردن؛ بەناخدابردن (ڕەووشت).
(٣) بێ بایەخ کردن؛ بایەخ شکاندن یا نزم کردنەوە.
(٤) شەرمەزارکردن؛ حەیاو ئابڕوو بردن.
(٥) خورانەوە؛ داخوران (زەمینناسی).
*v.i.* خۆ سووك کردن؛ خۆ شکاندن؛ ئابڕووی خۆ بردن.
**degraded** (di-grād′id), *adj.* (١) پلە نزم کراو.
(٢) بایەخ شکاو؛ بێ بایەخ (٣) سووك؛ نزم (٤) شەرمەزارکراو؛ ئابڕووبراو
**degrading** (di-grād′iŋ), *adj.* ئابڕووبەر؛ شەرمەزارکەر؛ ناشرین؛ لە پلەوپایە کەمکەرەوە؛ ئەنگ. *( a ~ job)* .
**degree** (di-grē′), *n.* (١) پلە. (٢) پلەوپایەی کۆمەڵایەتی. (٣) ڕادە
(٤) بڕوانامە (زانکۆ، قوتابخانە): *( an M.A. ~ )* .
(٥) پلەی بەراوورد (ڕێزمان):
*( The positive ~ of good is good, the comparative ~ is better, and the superlative ~ is best.)*
(٦) پلە (بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا):
*( A right angle has 90 ~s.)*
by degrees. ووردە ووردە؛ بەرە بەرە؛ ئەختە ئەختە.
to a degree, (١) تا ڕادەیەکی زۆر. (٢) ئەختێك.
**dehumanize** (dē-hū′mə-nīz′), *v.t.* لە مرۆڤایەتی کەمکردنەوە؛ لە مرۆڤایەتی خستن.
**-dehumanization *(n.).***
**dehydrate** (dē-hī′drāt), *v.t.* (١) ووشك کردنەوە (میوەهات).
(٢) ئاو لێ دەرهێنان (کیمیاگەری).
*v.i.* ووشکبوونەوە (لەش)؛ ئاو لە لەشدا کەم بوونەوە (نەخۆشی).

**devilish** (dev′'l-ish, dev′lish), *adj.* (١) شەیتانی؛ شەیتانانە
(٢) بزیو؛ هاروهاج (٣) [Colloq.]، زۆر بەدو ناپەسەند.
(٤) [Colloq.]، لە سنوور بەدەر؛ بێ رادە
*adv.* [Colloq.], زۆر؛ نیجگار زۆر.
**devil-may-care** (dev′'l-mā-kâr′), *adj.* بێباك؛ سەرکێش
**devilment** (dev′'l-mənt), *n.* کردەوەی شەیتانانە؛ کاری ناپەسەند
**devilry** (dev′'l-ri), *n.* (١) کردەوەی بەدو ناپەسەند.
(٢) بێباکی؛ بەزموڕەزم.
**devil's advocate,** یاریدەری شەیتان (ا) رابەرێکی کڵێسەی کاسۆلیکییە کە بە چاوێکی رەخنەگرانەوە وورد دەبێتەوە لە داوای ناوناني پیاوچاکێکی مردوو بە پیر. (ب) کەسێکە کە لایەنی چەوت دەگرێت لە مشتومڕێکدا هەر بۆ مشتومڕکردن یا نەحسی و ناپەسەندی.
**devil's-darning-needle,** پەپوولە قنگ باریکە
**deviltry** (dev′'l-tri), *n.* (١) بێباکی؛ سەرکێشی؛ بزێوی.
(٢) ناپەسەندی؛ بەدی. (٣) جادووگەری ناپەسەند.
**devious** (dē′vi-əs), *adj.* (١) خواروخێچ؛ نارێك؛ ناراستەوخۆ
(٢) فێڵباز؛ ساختەچی؛ سەرچەوت.
**devise** (di-vīz′), *v.t.* (١) (ا) درووستکردن؛ داهێنان؛ دۆزینەوە.
(ب) نەخشەکێشان *(They ~d a plan to escape from prison.)*
(٢) بۆ بەجێهێشتنی خانوو و زەوی‌وزار بە وەسیەت
(٣) [Obs.] بەشکردن؛ دابەشکردن
(٤) [Obs.] هەڵهێنان (شتی نهێنی)
*n.* (١) بەخشینێکی زەوی‌وزار بە وەسیەت.
(٢) وەسیەتێك کە ئەم زەوی‌وزارە ببەخشێت
(٣) ئەو خانوو و زەوی‌وزارەی بەم شێوەیە دەبەخشرێت.
**devisee** (dev′i-zē′, di-vīz′ē′), *n.* کەسێك کە خانوو و زەوی‌وزاری بە وەسیەت بۆ بەجێ مابێت
**devisor** (di-vī′zēr, di-vī′zôr), *n.* کەسێك کە خانوو و زەوی‌وزار بە وەسیەت بەجێ دەهێڵێت
**devitalize** (dē-vī′t'l-īz′), *v.t.* (١) کوشتن
(٢) بێ هێز کردن؛ لاوازکردن.
**-devitalization** *(n.).*
**devoid** (di-void′), *adj.* بێ؛ بەتاڵ؛ خاڵی
**devoir** (də-vwär′, dev′wär), *n.* (١) ئەرکی سەرشان
(٢) (pl.) رێز *(Pay your ~s to her.)*
**devolution** (dev′ə-lōō′shən, dev′'l-ū′shən), *n.* (١) گل بوونەوە (٢) گۆڕان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر (خاوەنێتی زەوی‌وزار، دەسەڵات، بەرپرسیاری). (٣) پێ سپاردن؛ دەسەڵات پێدان (بە جێگر).
(٤) بووکانەوە (زیندەوەرزانی)
**devolve** (di-volv′), *v.t. & v.i.* (١) گل بوونەوە
(٢) پێ سپاردن (دەسەڵات)؛ کەوتنە سەرشان (بەرپرسیاری).
**devote** (di-vōt′), *v.t.* تەرخان کردن؛ خۆ تەرخان کردن؛ دانان؛ بۆ دانان
**devoted** (di-vōt′id), *adj.* (١) دڵسۆز؛ جگەرسۆز *(a ~ friend).*
(٢) تەرخان کراو؛ دانراو
**devotee** (dev′ə-tē′), *n.* (١) دڵسۆز؛ حەزلێکەر *(a ~ of music).*
(٢) خۆبەختکەر بۆ ئاین؛ خۆتەرخانکەر بۆ ئاین
**devotion** (di-vō′shən), *n.* (١) خوا پەرستی؛ خواناسی؛ ئایینداری.
(٢) (pl.) نوێژ (٣) خۆبەختکردن؛ خۆتەرخان کردن؛ لەخۆبووردن.
(٤) (ا) دڵسۆزی؛ جگەرسۆزی (ب) خۆشەویستی
**-devotional** *(adj.).*
**devour** (di-vour′), *v.t.* (١) خواردن بە پەلەو چاوبرسی‌یانە؛ هەڵ لووشین (٢) هیچ نەهێشتنەوە؛ گسك لێدان؛ تەواوکردن.
(٣) قوسنەوە (بە چاو و بە گوێ) *(The child ~s fairy tales.)*
**devout** (di-vout′), *adj.* (١) خواپەرست؛ خواناس؛ ئایندار
(٢) لەخواترس؛ ئاینداری نوێن (٣) دڵسۆز؛ راستەقینە؛ پاك.

**dew** (dōō, dū), *n.* (١) ئاوڕنگ؛ شەونم
(٢) تازەیی و ناسکی (وەك شەونم).
(٣) دڵۆپی بریسکەدار یا ڕیزبەستوو (بەتایبەتی فرمێسك یا ئارەق).
**dewan, diwan** (di-wän′, di-wôn′), *n.* دیوان: کاربەدەستێکی هیندی گەورە (بەتایبەتی سەرەك وەزیران).
**dewdrop** (dōō′drop′, dū′drop′), *n.* دڵۆپی ئاوڕنگ؛ ئاوڕنگ.
**dewlap** (dōō′lap′, dū′lap′), *n.* غەبغەبەی بەرملی گاو مانگاو هەندێ گیانداری تر.
**dewy** (dōō′i, dū′i), *adj.* (١) شەونمی (٢) تەڕ
(٣) [Poetic]، خۆش و ناسك و هێمن.
**dexter** (dek′stēr), *adj.* (١) لای ڕاست؛ لەلای ڕاستەوە.
(٢) [Obs.]، بەهات.
**dexterity** (dek-ster′ə-ti), *n.* (١) بەدەست و پلی؛ چاپکی؛ کارامەیی لە بەکارهێنانی دەستدا. (٢) زیرەکی.
(٣) [Rare]، ڕاستەیی؛ ڕاستەڵەری.
**dexterous** (dek′strəs, dek′stēr-əs), *adj.* (١) بەدەست و پل؛ کارامە؛ چاپك (٢) زیرەك؛ دانا. (٣) [Rare]، ڕاستە؛ ڕاستەڵەر
**dextral** (dek′strəl), *adj.* (١) لای ڕاست؛ لەلای ڕاست.
(٢) ڕاستەڵەر؛ ڕاستە.
**dextrin** (dek′strin), *n.* ماددەیەکی لینجی وەك جەوی‌یە لە نیشاستە دەردەهێنرێت.
**dextrine** (dek′strin, dek′strēn), *n.* = dextrin.
**dextro-** (dek′strə), پێشگرێکە بەمانای: بەلای ڕاستەوە؛ لە ڕاستەوە
**dextrorotation** (dek′strə-rō-tā′shən), *n.* خولانەوە بەلای ڕاستدا (وەك کاتژمێر)
**-dextrorotary** *(adj.)*; **dextrorotatory** *(adj.).*
**dextrous** (dek′strəs), *adj.* dexterous.
**dharma** (där′mə, dur′mə), *n.* لە ئاینی بووزیدا: ئایینداری؛ پاکی؛ پەیڕەوی کردنی یاسای ئاینی.
**di-** (dī), پێشگرێکە بەمانای: دوان؛ جووتە؛ دوو ئەوەندە.
**dia-** (dī′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) بەناو؛ بەناویدا
(٢) بەجیا؛ لەنێواندا.
**diabetes** (dī′ə-bē′tis, dī′ə-bē′tēz), *n.* شەکرە؛ نەخۆشی شەکرە
**diabetic** (dī′ə-bet′ik, dī′ə-bē′tik), *adj.* تایبەتی بە نەخۆشی شەکرە؛ نەخۆشی شەکرەی هەیە؛ شەکرە.
*n.* کەسێکە کە نەخۆشی شەکرەی هەبێت.
**diabolic** (dī′ə-bol′ik), *adj.* (١) شەیتانی؛ شەیتانانە.
(٢) بەد؛ زۆر ناپەسەند؛ دڵڕەق *(a ~ person or plan)*
**diabolical** (dī′ə-bol′i-k'l), *adj.* = diabolic.
**diabolism** (dī-ab′ə-liz'm), *n.* (١) جادووگەری.
(٢) شەیتان پەرستی. (٣) کردەوە و ڕەووشتی بەد.
(٤) سرووشت و ڕەووشتی شەیتان.
**-diabolist** *(n.).*
**diacritic** (dī′ə-krit′ik), *adj.* (١) جیاکەرەوە؛ لەیەك جیاکەرەوە (وەك: سەروبۆر). (٢) دیاریکەر (پزیشکەوانی)؛ دەستنیشانکەر.
*n.* سەروبۆر.
**diacritical** (dī′ə-krit′i-k'l), *adj.* جیاکەرەوە (وەك: سەروبۆر)
*(a ~ mark)*
**diacritical mark,** سەروبۆر.
**diadem** (dī′ə-dem′), *n.* (١) کڵاوی زێڕین.
(٢) قوماشێکی بە زێڕ ڕازاوە کە پاشایانی ڕۆژهەڵات وەك تاج لەسەریان دەکرد
(٣) دەسەڵاتی شاهانە.
*v.t.* کڵاوی زێڕین کردنەسەر.
**diaeresis** (dī-er′ə-sis), *n.* = dieresis.
**diagnose** (dī′əg-nōs′, dī′əg-nōz′), *v.t. & v.i.* دۆزینەوە یا

دیاری کردن (نەخۆشی. گیروگرفت)؛ دەستنیشانکردن یا دەست خستنە سەر (نەخۆشی. گیروگرفت).

**diagnosis** (dī´əg-nō′sis), ***n.*** (١) دۆزینەوە یا دەستنیشانکردن (نەخۆشی. گیروگرفت). (٢) لێکۆڵینەوەی وورد (٣) ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە؛ بڕیارێك دەربارەی ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

**diagnostic** (dī´əg-nos′tik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە دۆزینەوە یا دەستنیشانکردنی نەخۆشی. (٢) نیشانەیی.

***n.*** (١) دەستنیشانکردن یا دۆزینەوەی نەخۆشی. (٢) نیشانە (نەخۆشی).

**-diagnostically** ***(adv.).***

**diagnostician** (dī´əg-nos-tish′ən), ***n.*** پزیشکی دەستنیشانکەر یا دۆزەرەوەی نەخۆشی.

**diagnostics** (dī´əg-nos′tiks), ***n.pl.*** زانستی دۆزینەوەی نەخۆشی یا دەستنیشانکردنی

**diagonal** (dī-ag′ə-n'l), ***adj.*** لار؛ لابەلا؛ خوار؛ چەپو ڕاست.

***n.*** هێڵی لابەلا، لار، خوار، یا چەپو ڕاست.

**diagonally** (dī-ag′ə-n'l-i), ***adv.*** بە لابەلایی؛ بە لاری؛ بە خواری.

**diagram** (dī′ə-gram´), ***n.*** نەخشە؛ وێنە؛ شێوەی ئەندازەیی.

**-diagrammatic** ***(adj.)***; **diagrammatical** ***(adj.)***; **diagrammatically** ***(adv.).***

**dial** (dī′əl, dīl), ***n.*** (١) کاتژمێری خۆری (٢) ڕووی کاتژمێر بە نمرەو دەستی کاتژمێرەکەوە. (٣) شووشەی ڕووی ڕادیۆ کە نمرەی ئێستگەکان و دۆزەرەوەی ئێستگەکان هەمووی دەگرێتەوە؛ خەپلەیەکی پلەپلەکراو (٤) خەپلەی تەلەفۆن (کە نمرەی لەسەرە بۆ بادان). (٥) ڕێنومای کرێکاری کانگە

***v.t. & v.i.*** (١) پێوان یا پیشاندان بە خەپلەی نمرەدار. (٢) دۆزینەوەو وەرگرتنی ئێستگەیەك لەسەر ڕادیۆ؛ بادان. (٣) بادانی نمرەی تەلەفۆن؛ سووڕاندنەوە؛ چەرخاندن.

**dialect** (dī′ə-lekt´), ***n.*** زار؛ لقی زمان؛ زمانی ناوچەیی؛ شێوە زمان.

**dialectal** (dī´ə-lek′t'l), ***adj.*** تایبەتی بە زمانی ناوچەیی.

**dialectic** (dī´ə-lek′tik), ***n.*** (١) دایەلیکتیك: لێکۆڵینەوەی ژیربێژی ووردی مەسەلەیەك بۆ گەیشتنە ئەنجام؛ لێکۆڵینەوە. (٢) دایەلیکتیك ڕێبازی ژیربێژی "هیگل" و "کارل مارکس".

**dialectical** (dī´ə-lek′ti-k'l), ***adj.*** دایەلیکتیکی؛ لێکۆڵینەوەیی.

**-dialectically** ***(adv.).***

**dialectical materialism,** ماددی د یەلیکتیکی

**dialectician** (dī´ə-lek-tish′ən), ***n.*** زانای ژیربێژی؛ شێوە زمان زان

**dialectics** (dī´ə-lek′tiks), ***n.pl.*** زانستی ژیربێژیو بنچینەکانی.

**dialectology** (dī´ə-lek-tol′ə-ji), ***n.*** لێکۆڵینەوەی شێوەکانی زمان

**dialog** (dī′ə-lôg´, dī′ə-log´), ***n.*** = dialogue.

**dialogue** (dī′ə-lôg´, dī′ə-log´), ***n.*** (١) گفتوگۆ؛ دەمەتەقێ؛ گفتوگۆی دووقۆلی؛ ووتووێژ. (٢) گفتوگۆی شانۆگەری یا چیرۆك ***( Plays are written in ~ .)*** . (٣) ووتوێژ بۆ گەیشتنە ڕێکەوتن

***v.i.*** گفتوگۆکردن؛ ووتوێژکردن

***v.t.*** بەشێوەی گفتوگۆ نووسین

**dial tone,** دەنگ یا تۆنی تەلەفۆن: ئەو دەنگەی تەلەفۆنە کە گوێت لێ دەبێت کاتێك کە یەکەم جار هەڵی دەگریت، نیشانەی کراوەیی‌یە، واتە بەتاڵەو دەتوانیت بەکاری بهێنیت

**dialysis** (dī-al′ə-sis), ***n.*** (١) جیاکردنەوەی گەردی بچووك لە هی گەورە یا ماددەی لیقن لەوەی کە بتوێتەوە بە پەردەیەکی تەڕ (کیمیاگەری). (٢) پاکردنەوەی خوێن (پزیشکەوانی)

**-dialytic** ***(adj.).***

**dialyze** (dī′ə-līz´), ***v.t.*** جیاکردنەوە یا پاکردنەوە (ووشەی پێشوو ببینە).

**diameter** (dī-am′ə-tēr), ***n.*** (١) تیرە (بازنە) (٢) ئەستووری؛ ئەستوورایی.

**-diametric** ***(adj.)***; **diametrical** ***(adj.).***

**diametrically** (dī´ə-met′ri-k'l-i, dī´ə-met′rik-li), ***adv.*** (١) یەکسەر؛ ڕاست؛ ڕاستەوخۆ؛ سەرانسەر. (٢) بەتەواوی؛ تەواو: ***( ~ opposed ideas)*** .

**diamond** (dī′mənd, dī′ə-mənd), ***n.*** (١) ئەڵماس. (٢) ئامێری ئەڵماس بڕین (بۆ بڕینی شووشە). (٣) لەبزینە (ئەندازە). (٤) دینار (کاغەزی یاریو قومار). (٥) (*pl.*)، دەستەیەك لەم کاغەزانە. (٦) دانەیەك لەم کاغەزانە. (٧) چاپێکی بچووك.

***adj.*** ئەڵماس؛ ئەڵماسی؛ بە ئەڵماس ڕازاوە.

**a rough diamond,** (١) ئەڵماسی خاو. (٢) کەسێکی ووشکی کەرتڕ بەڵام دڵپاك.

**diamond anniversary,** یادی شەستەم یا حەفتاوپێنجەم.

**diamond jubilee,** = **diamond anniversary.**

**diamond wedding,** یادی ژنهێنانو شووکردنی شەستەم یا حەفتاوپێنجەم.

**diaper** (dī′ə-pēr), ***n.*** دەرپێی منداڵی ساوا.

***adj.*** هی دەرپێی منداڵ.

***v.t.*** دەرپێ کردنەپێی منداڵ

**diaphanous** (dī-af′ə-nəs), ***adj.*** ڕۆشن.

**diaphone** (dī′ə-fōn´), ***n.*** دەنگی هاوئاواز

**diaphoresis** (dī´ə-fə-rē′sis), ***n.*** ئارەقی زۆر بەتایبەتی دەستکرد (پزیشکەوانی).

**-diaphoretic** ***(adj.).***

**diaphragm** (dī′ə-fram´), ***n.*** (١) دیوار یا پەردەی نێوان سنگو سك. (٢) پەردە یا دیواری جیاکەرەوە. (٣) پەردەیەکە دەخرێتە ناو زێوە بۆ سکپڕ نەبوون. (٤) ئامێری درووستکەری شەپۆلی دەنگ (تەلەفۆن، دەنگ گەورەکەر). (٥) ئامێری ڕێکخستنی پلەی ڕووناکی لە کامێراو مایکرۆسکۆبدا

**diarrhea, diarrhoea** (dī´ə-rē′ə), ***n.*** سکچوون؛ شۆری؛ ڕەوانی

**-diarrheal, diarrheic, diarrhetic** ***(adj.).***

**diary** (dī′ə-ri), ***n.*** (١) بیرنامەی ڕۆژانە. (٢) پەڕاوی بیرنامە.

**Diaspora** (dī-as′pə-rə), ***n.*** (١) سەرگەردانیی جوولەکە دوای دەستبەسەرییان لە بابل (٢) هەموو جوولەکەی سەرگەردان. (٣) سەرگەردانیی گەل؛ ئاوارەیی؛ پەرەوازەبوونی گەل (لەئەنجامی ڕاکردن لە چەوساندنەوە)

**diastole** (dī-as′tə-lē´), ***n.*** (١) خاوبوونەوەو حەوانەوەی دڵ لەدوای هەموو کرژبوونێك. (٢) درێژەپێدانی برگەی کورت (زمانەوانی یۆنانیو لاتینی).

**diathermy** (dī′ə-thûr´mi), ***n.*** چارەسەرکردنی نەخۆشی بە پێدابردنی تەزووی کارەبا بەناو ڕیشاڵەکانی لەشداو گەرم کردنەوەی.

**diathesis** (dī-ath′ə-sis), ***n.*** ئامادەیی زگماکی لەش بۆ گرتنی هەندێ نەخۆشی.

**diatom** (dī′ə-təm, dī′ə-tom´), ***n.*** قەوزەیەکی یەك خانەیی گەردبینیی‌یە ماددەی "سلیکا" ی تێدایە.

**diatribe** (dī′ə-trīb´), ***n.*** ڕەخنەو هێرشێکی زۆر توندوتیژو بڕ.

**diazine** (dī′ə-zēn´, dī′ə-zin, dī-az′in), ***n.*** ئاوێتەیەکی- کیمیاییە.

**dibble** (dib′'l), ***n.*** پێکارێکی نووك تیژە ئەوەندەی بژارکەرێکە بۆ هەڵکەندنی زەویو ناشتنی تۆو نەمامو شەتڵ بەکاردەهێنرێت.

***v.t.*** هەڵکەندنی زەوی بەم پێکارە بچووکە بۆ ناشتنی تۆو نەمامو شەتڵ

***v.i.*** (١) بەکارهێنانی ئەم پێکارە (٢) دان خستنە ئاوەوە بەئەسپایی بۆ ماسی گرتن

**dicast** (dī'kast, dik'ast), *n.* دادگەرێکی یۆنانی کۆن
**dice** (dīs), *n.pl.* (١) زار (تاوڵە، دۆمینە)؛ مۆرە
(٢) جورە قومارێکە بە زار دەکرێت.
(٣) پارچەیەکی بچووکی شەشلایی (خواردەمەنی)
*v.i.* زار فڕێدان؛ یاری کردن بە زار
*v.t.* (١) دۆڕاندن بە یاری کردن بە زار)
(٢) قاش کردن یا لەتکردنو کردن بە پارچەی زۆر بچووک (سەوزە، خواردن).
(٣) خانە خانە کردن.
**dicephalous** (dī-sef'ə-ləs), *adj.* دووسەرە (دەعبا)
**dicho-** (dī'kō, dī'kə), *Also* dich-, پێشگرێکە بەمانای: دوو؛ بە دوو بەشەوە
**dichotomize** (dī-kot'ə-mīz'), *v.t.* کردن بە دوو بەشەوە
**dichotomous** (dī-kot'ə-məs), *adj.* دووبەش: دوولا؛ دووفلیقانە.
**dichotomy** (dī-kot'ə-mi), *n.* (١) دووبەشی؛ دووفلیقانەیی؛ جیابوونەوەو بوون بە دوو بەشەوە (رووەکناسی)
(٢) دوولایی؛ دوو لای دژ بە یەک؛ دوو بەشی دژ بە یەک؛ جیاوازی؛ دووبەرەکی:
*( the ~ of truth and falsehood)*
**dichroism** (dī'krō-iz'm), *n.* (١) دوورەنگێتی هەندێ بلور.
(٢) دوورەنگێتی (فیزیا).
**-dichroic** *(adj.).*
**dichromatic** (dī'krō-mat'ik), *adj.* (١) دوورەنگ؛ دوورەنگە.
(٢) رەنگ کوێر؛ تەنها دوو رەنگ بین (پزیشکەوانی).
(٣) رەنگ گۆڕ لە قۆناغێکی تایبەتی ژیاندا (گیانەوەرناسی).
**dichromatism** (dī-krō'mə-tiz'm), *n.* (١) دوورەنگ؛ دوورەنگینی (٢) رەنگ کوێری؛ تەنها دوو رەنگ بینین (پزیشکەوانی).
**dick** (dik), *n.* (١) [British Slang]، زەلام؛ کابرا.
(٢) [Vulgar Slang]، کێر.
**dickens** (dik'nz, dik'inz), *n. & interj.* [Colloq.]. شەیتان
*( I cannot tell what the ~ his name is.)*
**dicker** (dik'ēr), *v.i. & v.t.* ئاڵوگۆڕکردن (باری ئابووری، رامیاری)؛ سەودا کردن؛ گۆڕینەوە.
*n.* ئاڵوگۆڕکاری؛ سەوداگەری؛ گۆڕینەوە.
**dickey** (dik'i), *n.* (١) بەرۆکی کراسی پیاوانە کە لە کراسەکە دەکرێتەوە.
(٢) یەخە یا بەرۆکی بلووسی ژنانە کە دەتوانرێت پێوەی بنرێتو لێ بکرێتەوە.
(٣) بەرواڵەکەی منداڵ. (٤) گوێدرێژ؛ کەر (٥) باڵندەی بچووک.
(٦) کورسی عەرەبانچی
(٧) کورسی نوشتاوەی دواوە لە گالیسکە یا ئوتومبیلدا.
**diclinous** (dī'kli-nəs, dī-klī'nəs), *adj.* یا نەر، یا مێ مێینەی هەیە (نێرەڵ یا هی نێرینە (نێرك) (رووەکناسی)
**dicotyledon** (dī'kot-'l-ē'd'n, dī-kot''l-ē'd'n), *n.* رووەکی دووفلیقانە
**dicta** (dik'tə), *n. alternative plural of* dictum.
**dictaphone** (dik'tə-fōn'), *n.* دیکتافۆن، ئامێری تۆمارکردنی دەنگ بۆ گوێ لێگرتنەوەی لە دوارۆژداو نووسینەوەی (بەتایبەتی لە فەرمانگەدا).
**dictate** (dik'tāt), *v.t. & v.i.* (١) پێ نووسینەوە؛ پێ نووسین:
*( The teacher ~d a passage to the pupils.)*
(٢) فەرمان بەسەرداکردن. (٣) بەسەردا سەپاندن؛ بەزۆر بەسەردادان.
(٤) فەرماندان بە هەوەسکاریو بەبێ سەروبەر.
*n.* فەرمان
**dictation** (dik-tā'shən), *n.* (١) پێ نووسینەوە؛ پێ نووسین؛ نووسینەوە؛ ڕێنووس (٢) شتێکی نووسراو بەم جۆرە:
*( You have many spelling mistakes in your ~ .)*
(٣) فەرمان
**dictator** (dik'tā-tēr, dik-tā'tēr), *n.* (١) دیکتاتۆر؛ زۆردار
(٢) پێ نووسەرەوە؛ کەسێك کە بە دەنگی بەرز شتێك دەخوێنێتەوە بۆ کەسێکی تر تا بینووسێت.
**dictatorial** (dik'tə-tôr'i-əl, dik'tə-tō'ri-əl), *adj.* دیکتاتۆری؛ زۆردارەکی؛ زۆردارانە؛ دیکتاتۆرییانە.
**dictatorship** (dik-tā'tēr-ship'), *n.* دیکتاتۆرێتی؛ زۆرداری؛
**dictatorship of proletariat,** دیکتاتۆرێتی پرۆلیتاری؛ دیکتاتۆرێتی چینی کرێکار
**diction** (dik'shən), *n.* (١) چۆنێتی بەکارهێنانی وشە؛ هەڵبژاردنی وشە بۆ رستە؛ وشەی بەکارهێنراو لە نووسین یا دوواندا:
*( Hemingway's ~ is easier than Shakespeare's.)*
(٢) شێوەی دووان یا گۆرانی ووتن؛ شێوەی ووتن.
**dictionary** (dik'shən-er'i), *n.* فەرهەنگ؛ قامووس.
**dictograph** (dik'tə-graf', dik'tə-gräf'), *n.* ئامێری تۆمار- کردنی ئاخاوتنی سەر تەلەفۆنی خەڵك بەدزییەوە.
**dictum** (dik'təm), *n.* (١) پەندی پێشینان؛ قسەی نەستەق.
(٢) بانگنامە یا رایەکی بڕواپێکراو.
(٣) تێبینی یا رایەکی دادگەر کە پێویست نییە پەیڕەوی بکرێت.
**did** (did), *past tense of* do.
**didactic** (dī-dak'tik), *adj.* (١) هی فێرکردن؛ بۆ فێرکردن بەکاردێت.
(٢) رەوروشتی باش فێرکەر: *( a ~ poem)*
(٣) لە رادە بەدەر حەزکەر لە تەمێکردنو مامۆستایەتی کردن لە کاتی ناکاتداو بۆ ئەوانەی گوێ ناگرن:
*( A ~ person; His ~ manner bothers people.)*
**-didactically** *(adv.)*; didacticism *(n.).*
**didactical** (dī-dak'ti-k'l), *adj.* = didactic.
**didactics** (dī-dak'tiks), *n.pl.* هونەری فێرکردن؛ مامۆستایەتی.
**diddle** (did''l), *v.i. & v.t.* [Colloq.]. بزوان بە هەموولایەکدا؛ هەڵبەزودابەزکردن
**diddle** (did''l), *v.i. & v.t.* [Colloq.]. (١) ساختەکردن؛ گزی کردن.
(٢) فەوتاندنی کەسێك (٣) کات بەفیڕۆدان.
**dido** (dī'dō), *n.* کەتن؛ فێڵو تەڵەکەیەکی شەیتانانە
**didst** (didst), شێوەی کۆنی رابوردووی کرداری ( do ) ە بۆ کەسی دووەم، لەگەڵ ( thou ) دا بەکاردەهێنرێت.
**didymous** (did'ə-məs), *adj.* دوانە (رووەکناسی، گیانەوەرناسی).
**die** (dī), *v.i.* (١) مردن؛ کۆچی دوایی کردن؛ تۆپین؛ مرداربوونەوە.
(٢) کوژانەوە (مەکینە)؛ پەککەوتن؛ وەستان. *( The engine ~d.)*
(٣) ( ~ away; ~ out; ~ down )، کزبوون؛ دامرکاندنەوە.
*( The storm ~d down.)*
(٤) نەمان؛ فەوتان؛ قڕتێکەوتن.
(٥) ( ~ to )، گوێ پێ نەدان؛ هەست مردن.
(٦) [Colloq.]، سوێ بوونەوە لەتاودا؛ بەتاسەوەبوون بۆ؛ زۆر حەزکردن.
*( I'm dying to know the secret.; He is dying for a drink.)*
(٧) مردنی گیان (ئاین).
die away, کزبوونو نەمان؛ بەرەبەرە بەسەرچوون.
die down, (١) کزبوونو نەمان؛ کپ بوون
*( The breeze died down.)*
(٢) دامرکانەوە (رووەك)؛ دامردنەوە.
die hard, بەئاسانی وازنەهێنان؛ بەرهەڵستی کردن تا دوا هەناسە.
die in hardness, هەتا مردن کردن؛ وازنەهێنان لە کار هەتا مردن.
die in one's bed, بە نەخۆشی یا لە پیریدا مردن.
die in one's boots, لە شەڕدا مردن
die off, یەکە یەکە مردن هەتا دواهەمین.
die out, (١) دامرکانەوە؛ کپ بوونەوە؛ کزبوون.
(٢) نەمان؛ فەوتان؛ کوێربوونەوە
**die** (dī), *n.* (١) زار (تاوڵە، دۆمینە)؛ مۆرە.

(٢) پارچەی بچووکی شەشلایی (سەوزە): ***( vegetables cut into ~s)*** .
(٣) دارێژگە؛ قاڵب

**the die is cast,** بڕیارەکە دراوەو هەڵناوەشێتەوە
**die casting,** قاڵب دارشتن
**die-hard, diehard** (dī′härd′), *adj.* سەرسەخت؛ کۆنەپەرست؛ کەللەڕەق
*n.* کەسێکی سەرسەخت یا کەللەڕەق؛ کەسێکی کۆنەپەرست.

**dieresis** (dī-er′ə-sis), *n.* (١) جیاکردنەوەی دوو تیپە بزوێنی تەنیشت یەك و بێژانی هەریەکەیان لەگەڵ بڕگەیەکدا: ( **naïve** ) .
(٢) ئەم نیشانەیە ( ¨ ) کە بریتییە لە دوو خاڵی بچووك دەخرێتە سەر دووەمین تیپە بزوێنی تەنیشت یەك بۆ بێژانی هەریەکەیان لەگەڵ بڕگەیەکدا: ( **coöperate** ) هەندێ جار لەجێی ئەم دوو خاڵە تەقەڵێك ( - ) بەکاردێت: ( **co-operate** ) (٣) وەستانێکی کورت لەکاتی بێژانی دێڕێکی هۆنراوەدا.
**-dieretic** *(adj.).*

**diesis** (dī′ə-sis), *n.* نیشانەیەکی دوو خەنجەرییە ( ‡ ) لە چاپەمەنیدا بەکاردەهێنرێت.

**diet** (dī′ət), *n.* (١) خۆراکی ڕۆژانە؛ خواردەمەنی ڕۆژانەی گیاندار؛ بژێو (٢) پارێز
*v.i. & v.t.* پارێزکردن لەبەر نەخۆشی یا قەڵەوی)

**diet** (dī′ət), *n.* (١) [Scot.] کۆڕی ڕۆژانەی ئەنجوومەنێك.
(٢) ئەنجوومەن؛ کۆڕ. (٣) پەرلەمان.

**dietary** (dī′ə-ter′i), *n.* (١) پەیڕەوی پارێز؛ پارێز.
(٢) خواردەمەنی بۆ بڕاوەی ڕۆژانە لە بەندیخانە یا خەستەخانەدا
*adj.* (١) پارێز؛ تایبەتی بە پارێزکردن
(٢) تایبەتی بە خواردەمەنی بۆ بڕاوەی ڕۆژانە.

**dietetic** (dī′ə-tet′ik), *adj.* تایبەتی بە خواردەمەنی ڕۆژانە
**dietetics** (dī′ə-tet′iks), *n.pl.* زانستی لێکۆڵینەوەی بژێوی پێویستی ڕۆژانە
**dietitian, dietician** (dī′ə-tish′ən), *n.* زانا یا پسپۆڕی بژێوی ڕۆژانە؛ خواردنناس

**differ** (dif′ẽr), *v.i.* (١) ( ~ **from** ) جیاوازبوون لە؛ لەیەك نەچوون.
(٢) ( ~ **with** ) دژبوون بە؛ ناکۆك بوون؛ لەگەڵ ڕێك نەکەوتن.

**difference** (dif′ẽr-əns, dif′rəns), *n.* (١) جیاوازی
(٢) ناکۆکی؛ نەگونجان. (٣) جیاوازی کردن. (٤) ماوە (بیرکاری).
**make a difference,** (١) بوون بە هۆی جیاوازی لە ئەنجامدا؛ گرنگ بوون (٢) جیاوازی کردن (لەنێوان دوو کەس یا زیاتر).
**split the difference,** (١) بەشکردنی ئەوەی دەمێنێتەوە؛ بەشکردنی جیاوازی نێوان هەردوولا. (٢) ڕێکەوتن و بڕینەوەی ناکۆکی (بە وازهێنان لە نیوەی مافی حق)
**what's the difference,** [Colloq.]. جا جیاوازی چییە؟

**different** (dif′ẽr-ənt, dif′rənt), *adj.* (١) جیا؛ جیاواز
(٢) جۆرەها. (٣) ناناسا
**-differently** *(adv.).*

**differential** (dif′ẽr-en′shəl), *adj.* (١) جیاواز؛ بەگوێرەی جیاوازی ***( a ~ tariff)*** . (٢) جیاکەرەوە
(٣) بزوانی جیا بەئەنجام هێنان ***( a ~ gear)***
(٤) تایبەتی بە جیاکاری و تەواوکاری (بیرکاری)

**differentiate** (dif′ẽr-en′shi-āt′), *v.t.* (١) لەیەك جیاکردنەوە: ***( to ~ varities of plants)***
(٢) جیاوازی کردن لەنێواندا؛ پاك‌وپیس کردن؛ لەیەك جیاکردنەوە: ***( to ~ between one's friends)***
(٣) جیاوازی درووستکردن لەنێواندا
*v.i.* جیاوازبوون؛ جیاوازی پەیدابوون لەنێواندا

**differentiation** (dif′ẽr-en′shi-ā′shən), *n.* (١) جیاوازی
(٢) جیاوازی کردن لەنێواندا؛ جیاکاری؛ جیاکردنەوە

**difficile** (dif′ə-sēl′), *adj.* سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ بەئەرك

**difficult** (dif′i-kəlt, dif′i-kult′), *adj.* (١) سەخت؛ گران؛ قورس؛ ناهەموار؛ ئاڵۆز؛ ناخۆش: ***( a ~ task, problem, situation, etc.)***
(٢) سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ بەئەرك: ***( a ~ person)*** .

**difficulty** (dif′i-kul′ti, dif′i-kəl-ti), *n.* (١) سەختی؛ گرانی؛ قورسی. (٢) تەگەرە؛ کۆسپ؛ دژواری.
(٣) ناخۆشی؛ گیروگرفت؛ گێژاو؛ ناهەمواری. (٤) تەنگانە.

**diffidence** (dif′i-dəns), *n.* نابڕوو؛ بڕوا بە خۆ نەبوون؛ شەرم.
**diffident** (dif′i-dənt), *adj.* بەنابڕوو؛ بڕوا بە خۆ نەبوو؛ شەرمن.
**diffract** (di-frakt′), *v.t.* شکاندنەوەو پەرش‌و بڵاوکردنەوەی تیشك.
**diffraction** (di-frak′shən), *n.* بڵاوبوونەوەی تیشك؛ شکانەوەو پەرش‌و بڵاوبوونەوەی تیشك.

**diffuse** (di-fūs′), *adj.* (١) پەرش‌و بڵاو؛ بڵاو.
(٢) درێژەپێدراو (باس، نووسین، دووان)؛ دووروودرێژ؛ درێژدادڕ.
*v.t. & v.i.* (١) پەرش‌و بڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ پەرش‌و بڵاوبوونەوە.
(٢) کزکردن (ڕووناکی)؛ کزبوون؛ کەمکردنەوە.
(٣) تێکەڵاوکردن و بڵاوکردنەوە (گاز، شلە).

**diffuser, diffusor** (di-fūz′ẽr), *n.* بڵاوکەرەوە (مرۆڤ، ئامێر)؛ پەرش‌وبڵاوکەرەوە.

**diffusion** (di-fū′zhən), *n.* (١) بڵاوی؛ پەرش‌وبڵاوی؛ بڵاوبوونەوە.
(٢) درێژەپێدان (نووسین، دووان)؛ زۆر لەسەر ڕۆیشتن.
(٣) تێکەڵاوبوونی گەردەکانی دوو ماددە یا زیاتر.
(٤) دانەوەی ڕووناکی لە ڕوویەکی نارێکەوە.

**dig** (dig), *v.t.* (١) هەڵکەندن (بیر، چاڵ، جۆگە).
(٢) لەژێر زەوی دەرهێنان؛ هەڵکەندن: ***( to ~ potatoes)*** .
(٣) ( ~ **up; ~ out** )، دۆزینەوە؛ دەرخستن: ***( we dug out the truth.)***
(٤) پێداکردن: ***( He dug his elbow into my ribs.)*** .
(٥) [Slang]، بەدڵ بوون؛ حەزلێکردن: ***( Do you ~ it? I ~ it.)***
*v.i.* (١) هەڵکەندن. (٢) ڕێگەکردنەوە بەهۆی هەڵکەندنەوە.
(٣) [Colloq.]، هەوڵدان؛ خەریك بوون؛ کۆشش کردن
*n.* (١) هەڵکەندن. (٢) توانج؛ قسەی بە توێکڵ.
**dig in,** (١) خەنەق هەڵکەندن.
(٢) خەنەق هەڵکەندن و چوونە ناوی بۆ خۆپاراستن. (٣) خۆ چەسپاندن.
(٤) [Colloq.]، دەستکردن بە خواردن.
**dig out,** هێنانەدەرەوە لەژێر زەویدا؛ دەرهێنان.
**dig up,** هەڵکەندن (زەوی)؛ کێڵان؛ هەڵکەندن (درەخت)؛ خستنەڕوو (نهێنی).

**digest** (di′jest), *v.t.* (١) پوختەکردن و ڕێکخستن.
(٢) هەرسکردن؛ پەلخوردکردن (٣) یارمەتی هەرسکردن دان.
(٤) تێگەیشتن؛ وەرگرتن و تێگەیشتن (بیروڕا) (٥) دەربڕین؛ پەسەندکردن؛ لەگەڵ هەڵکردن. (٦) نەرمکردنەوە بۆ تواندنەوە (کیمیاگەری).
*v.i.* هەرس بوون؛ پەلخوردبوون.
*n.* پوختە؛ کورتە.

**digestant** (di-jes′tənt, dī-jes′tənt), *adj. & n.* یارمەتیدەری هەرسکردن.

**digester** (di-jes′tẽr, dī-jes′tẽr), *n.* (١) کورتکەرەوە (بیروباوەڕ، باس)؛ پوختەکەر (٢) دەفری کوڵاندن و نەرمکردنەوە (کیمیاگەری)

**digestible** (di-jes′tə-b'l, dī-jes′tə-b'l), *adj.* هەرس دەکرێ.
**-digestibility** *(n.)*; **digestibleness** *(n.)*; **digestibly** *(adv.).*

**digestion** (di-jes′chən, dī-jes′chən), *n.* (١) هەرسکردن؛ هەرس؛ پەلخوردکردن. (٢) توانای هەرسکردن بوون.
(٣) تێگەیشتن؛ وەرگرتن و تێگەیشتن (بیروباوەڕ).

**digestive** (di-jes′tiv, dī-jes′tiv), *adj.* تایبەتی بە هەرسکردن؛ یارمەتیدەری هەرسکردن.
*n.* ماددەیەك کە یارمەتی هەرسکردن دەدات.

**digger** (dig'ẽr), *n.* (١) هەڵکەنەر (مرۆڤ، ئامێر)
(٢) ئامێر یا مەکینەی هەڵکەنین؛ بەشی هەڵکەنەری ئامێرێك.
(٣) [(-)] هیندییەکی سوور کە ڕەگی ڕووەك هەڵدەکەنێت و پێی دەژی.
(٤) جۆرە زەردەواڵەیەکە.
**diggings** (dig'iŋz), *n.* (١) کانگە؛ کان (بەتایبەتی زێڕ)
(٢) (/ /) کانزای لە کان دەرهێنراو
**digit** (dij'it), *n.* (١) پەنجە (دەست، پێ)
(٢) پانایی پەنجە (٣) نمرە؛ ژمارەی نێوان سفرو نۆ؛ ژمارەی لە دە کەمتر
**digital** (dij'i-t'l), *adj.* (١) پەنجەیی (٢) ژمارەیی.
*n.* (١) پەنجە (٢) کلیلێك کە بەدەست لێ بدرێت (وەك هی پیانۆ).
**digital computer,** کۆمپیوتەری ژمارەیی.
**dignified** (dig'nə-fīd'), *adj.* سەلار؛ سەنگین؛ سەربەرز؛ بەشکۆ.
**dignify** (dig'nə-fī'), *v.t.* گەورەکردن؛ ڕێزلێنان؛ شکۆپێدان؛
بایەخ پێدان.
**dignitary** (dig'nə-ter'i), *n.* پیاوی گەورە (لە شارێك یا وڵاتێکدا)؛
پیاوماقووڵ؛ پیاوی شکۆمەند.
**dignity** (dig'nə-ti), *n.* (١) سەربەرزی (٢) شکۆ
(٣) پلەی بەرز؛ پلەوپایەی بەرز
(٤) ڕێزی خۆ گرتن و هێمنی.
**digraph** (dī'graf, dī'gräf), *n.* دوو تیپی یەك دەنگ،
وەك (ph) (telephone) ، (sh) – (ship) ، (ea) – (read)؛
**digress** (də-gres', dī-gres'), *v.i.* لە باس لادان (نووسین، دووان).
**digression** (də-gresh'ən, dī-gresh'ən), *n.* لە باس لادان
(نووسین، دووان)
**digressive** (də-gres'iv, dī-gres'iv), *adj.* لە باس لادەر؛
تایبەتی بە لادان لە باس
**dihedral** (dī-hē'drəl), *adj.* دوولا؛ دووڕوو (ئەندازە)؛
*( a ~ angle)*
*n.* گۆشەی دوولا یا دووڕوو؛ گۆشەیەکە کە لە بەیەکگەیشتنی دوو ڕوو
پێکهاتبێ
**dike** (dīk), *n.* (١) جۆگە؛ ئاوبارە (٢) بەست؛ بەنداو.
(٣) کۆسپ؛ دیواری پارێزەر.
(٤) [Slang]، ئافرەتێکە کە حەز لە ئافرەتی تر بکات.
*v.t.* (١) پاراستن بە بەست؛ بەستوو بەدەوردا دروستکردن.
(٢) چۆڕاندنەوە بە جۆگەلێدان
**dilapidate** (di-lap'ə-dāt'), *v.i. & v.t.* پەڕپووت بوون؛
وێران بوون (خانوو)؛ وێرانکردن؛ ڕووخاندن.
-dilapidation *(n.).*
**dilapidated** (di-lap'ə-dāt'id), *adj.* کۆن و بێ کەلك (خانوو)؛
شەق وشڕ؛ پەڕپووت (خانوو)؛ وێرانە؛ ڕووخاو.
**dilatation** (dil'ə-tā'shən, dī-lə-tā'shən), *n.* (١) گەورەبوون؛
فراوانکردن (٢) فراوانکردنی ئەندامێکی لەش.
**dilate** (dī-lāt', di-lāt'), *v.t.* فراوانکردن (چاو بە دەرمان)؛
گەورەکردن *( to ~ the eye)*
*v.i.* (١) گەورەبوون؛ فراوان بوون
(٢) (~ on; ~ upon) بە دوورودرێژی لەسەر دووان یا نووسین.
**dilation** (dī-lā'shən, di-lā'shən), *n.* فراوان کردن بە دەرمان بۆ
تێبینی چاو؛
-dilation *(n.).*
**dilater, dilator** (dī-lāt'ẽr, di-lāt'ẽr), *n.* (١) فراوانکەر (مرۆڤ،
شت)؛ (٢) ماسولکەی فراوانکەری ئەندامێکی لەش
(٣) ئامێری فراوانکەر.
-dilatoriness *(n.)*; dilatory *(adj.).*
**dildo** (dil'dō), *n.* شتێك کە لە کێر بچێت.
**dilemma** (di-lem'ə), *n.* تەنگ و چەڵەمە؛ گیروگرفت؛ گێژاو

**dilettante** (dil'ə-tan'ti, dil'ə-tänt'), *n.* (١) هونەردۆستێکی
درۆ یا هەر بە ڕواڵەت؛ هەر بەناو هونەر خۆشەویست.
(٢) [Rare]، هونەرخۆشەویست.
*adj.* هونەرخۆشەویستی هەر بەناو یا ڕواڵەت.
-dilettantish *(adj.)*; dilettantism *(n.).*
**diligence** (dil'ə-jəns), *n.* (١) کۆشش؛ کۆڵنەدان لە کۆشش کردن.
(٢) وریایی؛ هوشیاری.
**diligence** (dil'ə-jəns), *n.* گالیسکەیەکی گشتی فەرەنسییە، واتە
هی کرێیە.
**diligent** (dil'ə-jənt), *adj.* (١) کۆششکەر؛ کۆڵنەدەر لە کۆشش کردن؛
هەمیشە خەریك (٢) وریا؛ هوشیار.
**dill** (dil), *n.* (١) شوویت؛ شیووت. (٢) تۆوی شوویت.
**dill pickle,** خەیاری ترشیات (شوویت تێکراو).
**dillydally** (dil'i-dal'i), *v.i.* کات بەفیڕۆدان؛ خۆخستن بە قنگدا؛
ڕاڕایی کردن.
**diluent** (dil'ū-ənt), *adj.* (١) ڕوونکەرەوە (شلە). (٢) تونکەرەوە.
*n.* شتێکی ڕوونکەرەوە.
**dilute** (di-lōōt', dī-lūt'), *v.t.* (١) ڕوونکردنەوە (بە ئاو یا شلەی تر).
(٢) گۆڕین و بێ هێز کردن (بە تێکەڵاوکردن لەگەڵ شتی تردا)؛ بێ تین کردن؛
ناڕەسەن کردن.
*adj.* ڕوون؛ ڕوونکراوە.
**diluted** (di-lōō'tid, dī-lū'tid), *adj.* ڕوون؛ ڕوونکراوە؛ بێهێز.
**dilution** (di-lōō'shən, dī-lū'shən), *n.* (١) ڕوونکردنەوە؛
ڕوون بوونەوە. (٢) شتێکی ڕوونکراوە یا بێهێزکراو
**diluvium** (di-lōō'vi-əm, di-lū'vi-əm), *n.* پاشماوەی لافاو
یا ڕووباری بەستەڵەك (لە خاك و بەرد).
-diluvial *(adj.).*
**dim** (dim), *adj.* (١) تاریك؛ نەختێك تاریك (ژوور). (٢) نادیار؛ لێڵ.
(٣) کز: *( a ~ light)* . (٤) تاریك: *( a ~ future)*
(٥) ڕەشبین؛ بێ هیوا: *( He took a ~ view of the situation.)* .
*v.t.* کزکردن (چرا، گلۆپ، ڕووناکی): *( to ~ the light)* .
*v.i.* (١) کزبوون.
(٢) کز نوواندن: *( The light of a candle is ~med by the sun.)*
*n.pl.* چرای کزی ئۆتومبیل.
take a dim view of, هیوا پێ نەبوون؛ لێ دوودڵ بوون؛ ڕەش بینین
**dime** (dīm), *n.* دایەم: دراوێکی ئەمەریکییە دەیەکی دۆلارێکە.
a dime a dozen, [Colloq.]. زۆروزەبەنە؛ بەئاسانی دەست دەکەوێ؛
هەرزان.
**dime novel,** چیرۆك یا داستانێکی بێ بایەخ.
**dimension** (də-men'shən), *n.* (١) لا؛ پانی و درێژی و ئەستووری؛
دووری. (٢) *(pl.)*، لاکان؛ دوولایییەکان؛ پانی و درێژی و ئەستووری:
*( the ~s of a room)*
(٣) ڕادە. (٤) مەودا؛ گرنگی.
-dimensional *(adj.).*
**dime store,** فرۆشگای ووردە بابەت و هەرزانبەها.
**diminish** (də-min'ish), *v.t.* کەمکردنەوە؛ هێنانەوەیەك؛ کزکردن؛
بچووك کردنەوە.
*v.i.* کەمبوونەوە؛ کزبوون: *( Food supplies have ~ed.)* .
**diminished** (də-min'isht), *adj.* کەم بووەوە؛ کزبوو:
*( a ~ mental capacity)*
**diminishing return,** یاسایەکی ئابوورییە دەڵێت: کە لە ڕادەیەکی
تایبەتی بە دواوە قازانج و بەرهەم نەك تەنها زیاد ناکەن بەپێی زیادکردنی
سەرمایە و کار بەڵکو کەمیش دەکەن.
**diminution** (dim'ə-nū'shən, dim'ə-nōō'shən), *n.* (١)–
کەمکردنەوە؛ کەمبوونەوە. (٢) کورتکردنەوەی ئاوازی مۆسیقا.

**diminutive** (də-min′yoo-tiv), *adj.* (١) بچووك؛ زۆر بچووك؛
بچووكتر لە قەبارەی ئاسایی. (٢) بچووكی دەردەبڕێ (ڕێزمان).
*n.* (١) كەسێك یا شتێكی زۆر بچووك.
(٢) ووشە یا ناوێكی بچووك كراوە بە خستنەسەری پاشگرێكی بچووككەرەوە:
( ringlet = ring+let; sonny = son+ -y; streamlet = stream+ let).
**dimly** (dim′li), *adv.* بە كزی (چرا، ڕووناكی)؛ بەلێڵی؛ بە تاریكی؛ بە ئاستەم
**dimmer** (dim′ēr), *n.* (١) كزكەر (مرۆڤ).
(٢) ئامێری بەرەبەرە كزكەر (تیاترۆ، سینەما، شانۆ).
**dimness** (dim′nis), *n.* (١) تاریكی؛ لێڵی
(٢) ڕەشبینی؛ بێ هیوایی.
**dimple** (dim′p'l), *n.* (١) چاڵایی زگماكی سەر ڕوومەت یا چەناگە.
(٢) وورده شەپۆلی ئاو؛ چاڵایی ڕوویەك
*v.t.* چاڵ تێكردن؛ چاڵ كردن.
*v.i.* چاڵ بوون
**dimwit** (dim′wit′), *n.* [Slang], كەسێكی بێ مێشك و كەر
**dimwitted** (dim′wit′id), *adj.* [Slang], بێ مێشك؛ كەر
**din** (din), *n.* دەنگ؛ دەنگەدەنگ؛ دەنگێكی بەرزی بەردەوام.
*v.t.* (١) دەنگەدەنگ كردن
(٢) بە دەنگی بەرزو پەیتا پەیتا دووبارەكردنەوە؛ مێشك كونكردن:
*( D~ the idea into his head.)*
*v.i.* دەنگەدەنگ كردن
**dinar** (di-när′), *n.* دینار
**dine** (dīn), *v.i.* شێوكردن؛ نانی ئێوارە خواردن.
*v.t.* بانگ كردن بۆ شێو؛ نانی ئێوارە پێدان:
*( He ~d her at his home.)*
**dine out,** شێو لە دەرەوە كردن؛ نانی ئێوارە لە دەرەوە خواردن، واتە لە چێشتخانە
**diner** (dīn′ēr), *n.* (١) شێوكەر لە دەرەوە؛ نان لە دەرەوە خۆر.
(٢) فارگۆنی نانخواردن لە شەمەندەفەرێكدا؛ فارگۆنی چێشتخانە.
(٣) چێشتخانەیەكی بچووك لە شێوەی فارگۆنی چێشتخانەدا.
**dinette** (dī-net′), *n.* ژووری نانخواردن
**ding** (diŋ), *v.i.* (١) زەنگ لێدان؛ دەنگێكی وەك هی زەنگ لێوەهاتن.
(٢) [Colloq.]، زۆروێژی كردن؛ ووتن و ووتنەوەی شتێك.
*v.t.* [Colloq.], مێشك كونكردن
*n.* دەنگی زەنگ؛ دەنگێكی وەك هی زەنگ.
**dingbat** (diŋ′bat′), *n.* (١) [Colloq.]، دار، بەرد، یا شتێكی وەها كە دەهاوێژرێت یا دەدرێت بە شتێكدا.
(٢) هێ!! ناوی چیە؟ چی پێ دەڵێن؟ (٣) [Slang]، پارە.
(٤) [Slang]، كەسێكی بێ لانەو دەربەدەرو گەڕۆك.
**ding-dong** (diŋ′dôŋ′, diŋ′doŋ′), *n.* دەنگی زەنگ لێدان
*adj. & adv.* گەرم (ێنشبركێ، ملەملێ)؛ بەجۆش
**dinghy** (diŋ′gi), *n.* (١) بەلەمی سەوڵ
(٢) بەلەمێكی بچووك
**dingle** (diŋ′g'l), *n.* دۆڵێكی بچووكی قووڵی چڕ
**dingy** (din′ji), *adj.* پیس و یۆخڵ (ژوور، شوێن)؛ تاریك، پیس و ناخۆش و بۆگەن كردوو *( a ~ room)*
-dingily *(adv.)*; dinginess *(n.)*.
**dingy** (diŋ′gi), *n.* = dinghy.
**dining car,** فارگۆنی چێشتخانەی ناو شەمەندەفەر
**dining room,** ژووری نانخواردن؛ ژووری شێوكردن.
**dinkey** (diŋ′ki), *n.* مەكینەیەكی بچووكی خۆبزوێنە لە ئێستگەی شەمەندەفەردا بەكاردەهێنرێت بۆ گواستنەوەی فارگۆن یا شەمەندەفەر لە هێڵێكەوە بۆ هێڵێكی تر

**dinky** (diŋ′ki), *adj.* (١) [Slang]، بچووك (شوێن، مرۆڤ، شت)؛ گەنگ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ؛ ناگرنگ.
(٢) [British Slang]، خنجیلە؛ جوانكیلە.
**dinner** (din′ēr), *n.* (١) ژەمی سەرەكی ڕۆژانە (ئێوارە بخورێت یا نیوەڕۆ)؛ شێو؛ نانی ئێوارە.
(٢) شێوێكی ڕەسمی بە خۆشی كەسێك یا یادكردنەوەیەكەوە
**dinner jacket,** = tuxedo.
**dinnerware** (din′ēr-wâr′), *n.* (١) قاپ‌وقاچاغی نانخواردن
(٢) تاقم یا دەستەیەك لەم قاپ‌وقاچاغە.
**dinosaur** (dī′nə-sôr′), *n.* داینەسۆر؛ گیاندارێكی خشۆكی زۆر گەورەی قڕتێكەوتووە.
-dinosaurian *(adj. & n.)*; dinosauric *(adj.)*.
**diocese** (dī′ə-sēs′, dī′ə-sis), *n.* سەرەك قەشەنشین؛ ناوچەی لێپرسراوی سەرەك قەشە.
-diocesan *(adj. & n.)*.
**Dionysus, Dionysos** (dī′ə-nī′səs), *n.* خودای سەوزی و مەی (ئەفسانەی یۆنانی)
-Dionysian *(adj.)*.
**dioxide** (dī-ok′sīd), *n.* دووەم ئۆكسید *( carbon ~ )*.
**dip** (dip), *v.t.* (١) تێهەڵكێشان؛ تێخستن و دەرهێنانەوە؛ پیاكردن؛ پەنجە یا شت كردن بە شلەیەكداو دەرهێنانەوەی:
*( to ~ one's pen in the ink)*
(٢) لە خوم هەڵكێشان
(٣) لە ناو هەڵكێشان (خاچ پەرستی): *( to ~ in water)*
(٤) مەڕ هەڵكێشان لە دەرماناو بۆ پاككردنەوەی.
(٥) (ا) دەست پێداكردن و دەرهێنان:
*( He ~ped his hand into his pocket.)*
(ب) (~ out)، هەڵهێنجان
(٦) دانەواندن و كوتوپڕ بەرزكردنەوە: *( to ~ a flag in salute)*.
(٧) مۆم دروستكردن بە تێهەڵكێشانی پلیتەكە لە مۆمی تواوەدا
*v.i.* (١) خۆفڕێدانە ناو ئاو و یەكسەر هاتنەدەرەوە
(٢) لەپڕ شكان (نرخ)؛ نەختێك هاتنەخوارەوە (نرخ)
(٣) وەك تێكەوتن یا كەوتنەناو وابوون:
*( The sun ~s into the ocean.)*
(٤) بەرەوخواربوونەوە؛ شۆڕبوونەوە:
*( The land ~s gently to the south.)*
(٥) دەست یا دەفر شۆڕكردنەوە بۆناو ئاو یا شتی تر بۆ لێ دەرهێنان؛ هەڵهێنجان (٦) پەرەپەرەكردن و خوێندنەوەی لاسەرلایی.
*n.* (١) تێهەڵكێشان؛ تێخستن؛ پیاكردن.
(٢) خۆفڕێدانە ناو ئاوەوە.
(٣) ئاو یا شلەیەك كە شتی تێ هەڵدەكێشرێت؛ خوم.
(٤) بەرەوخواركە؛ لێژایی.
(٥) مۆم دروستكردن بە تێهەڵكێشانی پلیتەكە لە مۆمی تواوە.
(٦) كلۆری (٧) هاتنەخوارەوە یا داكەوتنێكی كەم (فرۆكە)
(٨) [Colloq.]، مەزەی شل
(٩) [Slang]، گیرفانبر.
**dip one's hand into one's purse,** دەستبلاوی كردن؛ پارە خەرج كردن بە بەرەڵایی.
**go for ( take, have ) a dip,** مەلەكردن بۆ ماوەیەكی كورت.
**diphtheria** (dif-thêr′i-ə, dip-thêr′i-ə), *n.* نەخۆشی وەناق؛ دیفتیریا.
-diphtherial *(adj.)*; diphtheric *(adj.)*; diphtheritic *(adj.)*.
**diphthong** (dif′thôŋ, dip′thôŋ, dif′thoŋ), *n.* جووتە بزوێن (دەنگناسی)؛ دوو بزوێن كە پێكەوە دەبێژرێن: وەك دەنگی "او" لە ووشەی (house)، دەنگی "ۆی" لە ووشەی (voice)، هەروەها دەنگی "ۆی" لە

ووشەی (boy) دا... هتد).
-diphthongal (adj.); diphthongize (v.t. & v.i.);
diphthongization (n.).

**diploma** (di-plō'mə), *n.* (١) بڕوانامەیەکی ڕەسمی یا فەرمانڕەوایی؛ بەڵگەنامەیەکی مێژوویی. (٢) بڕوانامە.
(٣) بڕوانامەی دەرچوون لە قوتابخانە؛ دبلۆم.

**diplomacy** (di-plō'mə-si), *n.* (١) دیبلۆماسیەت؛ کاری دیبلۆماسیەت؛ هونەری گفتوگۆکردنی سیاسی.
(٢) ناسکی (ڕەووشت)؛ زمان شیرینی.

**diplomat** (dip'lə-mat'), *n.* (١) دیبلۆماسی؛ کەسێکی دیبلۆماسی
(٢) زمان شیرین؛ کەسێکی ناسک و زمان شیرین

**diplomatic** (dip'lə-mat'ik), *adj.* (١) دیبلۆماسی؛ تایبەتی بە کاری دیبلۆماسی. (٢) زمان شیرین؛ ناسک و زمان لووس: *(He is very ~.)*.
-diplomatically *(adv.)*.

**diplomatic corps,** دەستەی دیبلۆماسیەیان لە پایتەختی وڵاتێکدا (کە سەرجەم باڵیۆز و کاربەدەستە گەورەکانی باڵیۆزخانەکان دەگرێتەوە).

**diplomatic immunity,** پارێزگاری دیبلۆماسی؛ ئازادی دیبلۆماسی (لە لێپرسینەوە و سزا).

**diplomatist** (di-plō'mə-tist), *n.* = **diplomat.**

**diplopia** (di-plō'pi-ə), *n.* جووت بینی نەخۆشییەکی چاوە بریتییە لە بینینی دوو شت لەبری یەکێک.
-diplopic *(adj.)*.

**dip needle,** دەرزی لاربوونی موگناتیسی.

**dipper** (dip'ēr), *n.* (١) لە شلە هەڵگێش (خومچی، مۆم دروستکەر).
(٢) چەمچە؛ دەفری پێ هەڵهێنجان
(٣) [D-]. ناوی دوو کۆنەستێرەیەکە لە چەمچە دەچن: *(Big D~ and Little D~)*
(٤) چەند جۆرە باڵندەیەکە کە خۆیان فڕێ دەدەنە ناو ئاوەوە بۆ نێچیرگرتن.

**dipsomania** (dip'sə-mā'ni-ə), *n.* تێر نەخواردنەوە لە مەی یا عەرەق یا خواردنەوەی سەرخۆشکەری تر
-dipsomaniac *(adj.)*; dipsomaniacal *(adj.)*.

**dipstick** (dip'stik'), *n.* شیشی پێوانی قووڵی شلە؛ شیشی پێوانی ڕۆنی مەکینەی ئوتومبیل

**dipt** (dipt), *past tense and past participle of* **dip.**

**dire** (dīr), *adj.* ئێجگار زۆر؛ زۆر خراپ؛ زۆر پەرێشان: *(in ~ need of help)*

**direct** (də-rekt', dī-rekt'), *adj.* (١) ڕاست؛ ڕاستەوڕێ؛ ڕاستەوخۆ: *(a ~ way)*
(٢) بێ پێچ‌وپەنا؛ ڕاستەوڕاست؛ لەڕوو: *(I want a ~ answer, "Yes" or "No".)*
(٣) ڕاستەوخۆ؛ یەکسەر: *(~ elections; ~ contact)*.
(٤) نەپچڕاو؛ ڕاستەوخۆ (نەوە، وەچە): *(a ~ descendant)*.
(٥) تەواو؛ سەرانسەر: *(the ~ opposite)*.
(٦) ڕاستەوانە (بیرکاری): *(a ~ relationship)*.
(٧) نەگۆڕ (تەزووی کارەبا)؛ ڕاستەوخۆ: *(~ current)*.
*v.t.* (١) بەڕێوەبردن؛ ڕابەری کردن؛ ڕێک‌وپێک کردن.
(٢) فەرمان بەسەردا کردن؛ فەرمان پێدان؛ پێ ووتن: *(The officer ~ed his men to advance slowly.)*
(٣) ئاراستەکردن؛ ناردن.
(٤) ڕێ پیشاندان؛ ناونیشان بۆ هەڵدان: *(Can you ~ me to the post office?)*
(٥) ڕووتێکردن؛ ووتە ئاراستەکردن: *(I'm ~ing my remarks to you.)*
(٦) ناونیشان نووسین لەسەر نامە.
(٧) سەرکردەیی کردن؛ چاوساغی کردن؛ ڕێ پیشاندان.
(٨) نەخشە بۆ دانان و سەرپەرشتی کردن؛ بەڕێوەبردن: *(to ~ a film or a play)*
*v.i.* (١) پێ ڕاگەیاندن؛ ڕێ پیشاندان؛ ڕابەری کردن.
(٢) سەرکردایەتی کردن (ئۆرکێسترا).
*adv.* ڕاستەوخۆ؛ یەکسەری؛ ڕاستەوڕاست

**direct action,** کرداری ڕاستەوخۆ؛ کردەوەی یەکسەر.

**direct current,** تەزووی کارەبای نەگۆڕ؛ تەووژمی کارەبای ڕاستەوخۆ.

**direct discourse,** = **direct speech.**

**direction** (də-rek'shən, dī-rek'shən), *n.* (١) بەڕێوەبردن؛ سەرپەرشتی. (٢) ناونیشان (نامە، پریاسکە، پۆستە).
(٣) *(pl.)* ئامۆژگاری؛ ڕاگەیاندن: *(He gave me the ~s to his house.; ~s to how to use a medicine)*
(٤) فەرمان. (٥) ڕێباز؛ ڕێڕەو؛ ڕێگە. (٦) لا؛ ڕوو؛ ئاست؛ ئاراستە
(٧) (ا) ئامۆژگاری سەرپەرشتیکەری فیلم یا شانۆگەری بۆ ئەکتەرەکان
(ب) ئامۆژگاری سەرکردەی ئۆرکێسترا بۆ ئاوازژەنەکان.

**directive** (də-rek'tiv, dī-rek'tiv), *adj.* (١) ڕێ پیشاندەر؛ ڕابەری. (٢) تایبەتی بە بەڕێوەبردن؛ هی ئامۆژگاری.
*n.* فەرمان (لە سوپا، فەرمانڕەوایی، یا کاربەدەستێکەوە)؛ ئامۆژگاری؛ ڕاگەیاندن

**directly** (də-rekt'li, dī-rekt'li), *adv.* (١) ڕاستەوخۆ؛ یەکسەر؛ ڕاستەوڕاست. (٢) یەکسەر؛ بێ دواکەوتن؛ هەر ئێستا: *(I'll come ~.)*
(٣) تەواو؛ سەرانسەر: *(~ opposite)*.
(٤) بێ پێچ‌وپەنا.

**direct object,** کار لەسەر یا کارلێکراوی سەرەکی (ڕێزمان)؛ تەواوکەری ڕاستەوخۆ.

**director** (də-rek'tēr, dī-rek'tēr), *n.* (١) بەڕێوەبەر؛ کارگێڕ؛ سەرپەرشتیکەر. (٢) ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمپانیایەک
(٣) سەرپەرشتیکەری فیلمێکی سینەمایی یا شانۆگەرییەک
(٤) سەرکردەی ئۆرکێسترا.
-directorial *(adj.)*.

**directorate** (də-rek'tə-rit, dī-rek'tə-rit), *n.* (١) بەڕێوەبەرێتی؛ پلەی بەڕێوەبەر. (٢) ئەنجوومەنی بەڕێوەبەران (کۆمپانیا)

**director general,** بەڕێوەبەری گشتی؛ کارگێڕی گشتی

**directorship** (də-rek'tēr-ship', dī-rek'tēr-ship'), *n.* پلە و پایەی بەڕێوەبەر؛ بەڕێوەبەرێتی.

**directory** (də-rek'tə-ri, dī-rek'tə-ri), *n.* (١) ڕێ پیشاندەر؛ ڕابەر (شت). (٢) (ا) ڕابەرنامەی تەلەفۆن: *(telephone ~)*.
(ب) ڕابەرنامەی فەرمانگەیەک.
(٣) پەرتووکی ئامۆژگاری یا ڕاگەیاندن
(٤) ئەنجوومەنی بەڕێوەبەران
(٥) [D-]، ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرانی فەرمانڕەوایی فەرەنسا ١٧٩٥-١٧٩٩

**direct primary election,** هەڵبژاردنی سەرەتایی ڕاستەوخۆ.

**directress** (də-rek'tris, dī-rek'tris), *n.* بەڕێوەبەری ژن؛ کارگێڕی ژن.

**direct speech; direct discourse,** ووتەی دەقاودەقی بێژەر (ڕێزمان)؛ ووتەی ڕاستەوخۆی قسەکەر.

**direct tax,** باجی ڕاستەوخۆ (وەک باجی دەرامەت).

**direful** (dīr'fəl), *adj.* زۆر خراپ؛ بەد.

**dirge** (dûrj), *n.* شیوەن؛ شین؛ واوەیلێ.

**dirigible** (dir'i-jə-b'l), *adj.* ئاراستە دەکرێت؛ لێ دەخوڕرێت
*n.* باڵۆنی مەکینەدار.

**dirk** (dûrk), *n.* خەنجەر.
*v.t.* خەنجەرلێدان.

**dirt** (dûrt), *n.* (١) پیسی؛ پیسایی؛ چڵک؛ گەندوگوو؛ چەپەڵی؛ پۆخڵی.
(٢) خاک؛ گڵ؛ خۆڵ؛ خاک‌وخۆڵ.

(٣) شتێکی پیس و بێ بایەخ *(He treats her like ~.)*
(٤) نووسین یا دووانی بێ پەردە
(٥) بەدگۆیی؛ ووت‌ووات؛ فیتنەبازی
(٦) خاک‌وخۆڵ و بەردی تێکەڵاو بە کانزا (کە بە شۆردنەوە لێی جیادەکرێتەوە).
**do one dirt,** [Slang]. ئازاردان بە بەدگۆیی، کردەوەی ناپەسەند، یا ساختە لێ کردن
**dirt-cheap** (dũrt′chēp′), *adj. & adv.* [Colloq.]. زۆر هەرزان؛ بەلاش
**dirtiness** (dũr′ti-nis), *n.* پیس‌وپۆخلی؛ چەپەڵی؛ پیسی.
**dirty** (dũr′ti), *adj.* (١) پیس؛ پیس‌وپۆخل؛ چەپەڵ.
(٢) بێ پەردە؛ هەڵماڵراو؛ بێ شەرم: *(~ jokes)*
(٣) پیس‌وبۆگەن؛ نزم؛ نامەرد؛ شایستەی قێزلێهاتنەوەیە.
(٤) لیل. *(a ~ green)*
*v.t. & v.i.* پیس کردن؛ پیس‌وپۆخل کردن؛ پیس بوون؛ لەکەدارکردن.
**dis-** (dis), پێشگرێکە بەمانای نە، دژ، نەهێشتن، ڕێگەنەدان، دەرکردن
**disability** (dis′ə-bil′ə-ti), *n.* پەککەوتەیی؛ زەبوونی؛ کەفتەیی؛ کەم ئەندامی؛ کەفتەکاری؛ پەککەوتن.
**disable** (dis-ā′b′l), *v.t.* پەکخستن؛ لەکارخستن؛ زەبوون کردن؛ کەفتەکارکردن
-**disablement** *(n.)*; **disabled** *(adj.)*.
**disabuse** (dis′ə-būz′), *v.t.* ڕاستی پێ وتن؛ بەهەڵەدانەبردن؛ لە خەیاڵ پلاوی ڕزگارکردن؛ درۆودەلەسە بۆ نەکردن
**disaccord** (dis′ə-kôrd′), *v.i.* لەگەڵ ڕێک نەکەوتن؛ ناکۆکی لەگەڵ بوون.
*n.* ڕێک نەکەوتن؛ ناکۆکی.
**disaccustom** (dis′ə-kus′təm), *v.t.* ڕزگارکردن لە خوو
**disadvantage** (dis′əd-van′tij, dis′əd-vän′tij), *n.* (١) باری نەهات یا ناپەسەند؛ کۆسپ. (٢) زیان؛ خراپە
*v.t.* زیان لێدان؛ کۆسپ لە ڕێگەدا دانان.
**at a disadvantage,** هاوتا نەبوون؛ هەل کەمتر و بێ دەستتر:
*(We were fighting at a disadvantage.)*
**disadvantaged** (dis′ad-vən-tā′jid), *adj.* بێ بەش لە خۆش‌گوزەرانی و حێز و خۆشی ژیان لەڕووی تەندرووستی و پلەی خوێندەواری و خۆراک و مافی کۆمەڵایەتی‌یەوە
**disadvantageous** (dis′ad-vən-tā′jəs), *adj.* زیانبەخش؛ نەهات؛ ناپەسەند
**disaffect** (dis′ə-fekt′), *v.t.* لێ تەکاندنەوە؛ هەست ساردکردنەوە بەرامبەر؛ دڵ ئێشاندن؛ زویرکردن.
**disaffected** (dis′ə-fek′tid), *adj.* زویر؛ دڵ ئێشاو؛ نارازی، ناحەز، یا دژ بە فەرمانڕەوایی
**disaffection** (dis′ə-fek′shən), *n.* زویری؛ دڵ ئێشان؛ ناحەزی؛ لێ تەکینەوە؛ هەست ساردی بەرامبەر
**disaffiliate** (dis′ə-fil′i-āt′), *v.t. & v.i.* خۆکشانەوە پەیمان، ڕێکەوتن، یەکێتی؛ خۆ لێ تەکاندنەوە
**disaffirm** (dis′ə-fũrm′), *v.t.* حاشا لێ کردن؛ بەرپەرچدانەوە
-**disaffirmation** *(n.)*.
**disagree** (dis′ə-grē′), *v.i.* (١) لەگەڵ ڕێک نەکەوتن؛ ناکۆکی لەگەڵ بوون؛ بیرورا یەک نەبوون *(Even friends sometimes ~.)*.
(٢) جیاوازی بوون لەگەڵ یا لەنێواندا
*(The two reports about the accident ~.)*
(٣) ~ **with**، نەگونجان لەگەڵ تەندرووستی؛ زیان پێدان:
*(Milk ~s with me.)*
**disagreeable** (dis′ə-grē′ə-b′l), *adj.* (١) ناخۆش؛ ناپەسەند
*(~ weather, or circumstances)*
(٢) ڕووگرژ؛ تەنگەچیکلانە؛ بەدسرووشت؛ ناپەسەند (مرۆڤ):
*(a ~ person)*
-**disagreeably** *(adv.)*.
**disagreement** (dis′ə-grē′mənt), *n.* (١) ناکۆکی؛ ڕێک نەکەوتن؛ ناڕێکی. (٢) جیاوازی (بیرورا).
(٣) نەگونجان؛ جیاوازی: *(There is ~ between the two reports.)*.
(٤) دەمەقاڵێ؛ ناکۆکی.
**disallow** (dis′ə-lou′), *v.t.* ڕێ (پێ) نەدان؛ پەسەند نەکردن.
-**disallowance** *(n.)*.
**disannul** (dis′ə-nul′), *v.t.* سڕینەوە؛ بەتاڵ کردنەوە (پەیمان)
**disappear** (dis′ə-pêr′), *v.i.* (١) لە چاو وون بوون؛ ئاوابوون؛ بزربوون. (٢) لەناوچوون؛ سەرنگوم بوون؛ نەمان؛ وون بوون؛ قڕتێکەوتن
**disappearance** (dis′ə-pêr′əns), *n.* (١) لە چاو وون بوون. (٢) لەناوچوون؛ نەمان؛ قڕتێکەوتن.
**disappoint** (dis′ə-point′), *v.t.* (١) نائومێدکردن؛ ناکام کردن؛ دڵشکست کردن؛ دڵ شکاندن. (٢) تێک شکاندن (پلان، نەخشە)؛ تێکدان.
**disappointed** (dis′ə-poin′tid), *adj.* نائومێد؛ ناکام؛ دڵشکست؛ هەناسەسارد؛ هیوابڕاو.
**disappointing** (dis′ə-point′iŋ), *adj.* نائومێدکەر؛ هیوابڕ؛ دڵشکستکەر: *(a ~ person, or event)*.
**disappointment** (dis′ə-point′mənt), *n.* (١) نائومێدی؛ ناکامی؛ دڵشکستی: *(There were many ~s along the way.)*
(٢) کەسێکی نائومێدکەر؛ شتێکی هیوابڕ.
**disapprobation** (dis′ap-rə-bā′shən, dis-ap′rə-bā′shən), *n.* پەسەند نەکردن؛ حەز لێ نەکردن؛ بەدڵ نەبوون.
**disapproval** (dis′ə-prōōv′′l), *n.* پەسەند نەکردن؛ نارەزامەندی؛ ڕا لەسەر نەبوون.
**disapprove** (dis′ə-proov′), *v.t.* (١) پەسەند نەکردن؛ بەدڵ نەبوون؛ سەرزەنشت کردن؛ ڕا لەسەر نەبوون؛ ڕق لێ بوون:
*(We ~ of the military attack.)*
(٢) پەسەند نەکردن:
*(The director ~d her request for a promotion.)*
-**disapprovingly** *(adv.)*.
**disarm** (dis-ärm′), *v.t.* (١) چەک کردن؛ چەک داماڵین؛ چەک پێ دانان.
(٢) دڵ هێنانەوە جێی خۆ بە زمان شیرینی یا کردەوە:
*(I felt angry but her smiles ~ed me.)*
*v.i.* (١) چەک فڕێدان؛ خۆ چەک کردن
(٢) کەمکردنەوەی چەک؛ چەک داماڵینی وڵاتێک:
*(Every country must ~.)*
**disarmament** (dis-är′mə-mənt), *n.* (١) چەک فڕێدان؛ چەک داماڵین. (٢) کەمکردنەوەی چەک یا خۆ چەک کردنی وڵاتان:
*(D~ is the most important issue of our time.)*
(٣) بێ چەکی؛ چەک نەبوون.
**disarming** (dis-ärm′iŋ), *adj.* دڵ هێنەرەوە جێی خۆ بە کردەوە یا زمانی شیرین: *(a ~ smile, or person)*
**disarrange** (dis′ə-rānj′), *v.t.* تێک‌وپێکدان؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ کردن؛ شێواندن.
-**disarrangement** *(n.)*.
**disarray** (dis′ə-rā′), *v.t.* (١) پشێوی خستنەوە؛ شێواندن؛ تێکدان
(٢) خۆ ڕووتکردنەوە؛ جل داکەندن.
*n.* پشێوی؛ شێواوی؛ تێکەڵاووپێکەڵاو: *(to throw into ~.)*.
**disassemble** (dis′ə-sem′b′l), *v.t.* هەڵوەشاندن (مەکینە)؛ لەیەککردنەوە (پارچەکانی مەکینە یا نامێرێک).
-**disassembly** *(n.)*.
**disassociate** (dis′ə-sō′shi-āt′), *v.t.* پەیوەندی پچڕاندن؛ خۆ جیاکردنەوە؛ لەیەک جیاکردنەوە.

**disaster** (di-zas′tẽr, di-zäs′tẽr), ***n.*** کارەسات؛ لێقەومان؛ بەلا؛ کارەڕەهات؛ نەگبەتی.

**disasterous** (di-zas′trəs, di-zäs′trəs), ***adj.*** کارەساتی؛ زۆر خراپ (لێقەومان، کردەوە).

**disavow** (dis′ə-vou′), ***v.t.*** حاشالێکردن؛ خۆ لێ تەکاندنەوە؛ دەست لێ هەلگرتن؛ وازهێنان

**disavowal** (dis′ə-vou′əl), ***n.*** حاشاکردن؛ خۆ تەکاندنەوە؛ دەست هەلگرتن

**disband** (dis-band′), ***v.t.*** (١) هەلوەشاندنەوە؛ ناشبەتاڵ پێکردن؛ بلاوەپێکردن (ڕێکخراو، کۆمەل)؛ دوایی پێ هێنان. (٢) دەرکردن لە سوپا.

***v.i.*** بلاوەلێکردن؛ هەلوەشانەوە؛ ناشبەتاڵ لێکردن؛ دوایی هاتن.

**-disbandment *(n.).***

**disbar** (dis-bär′), ***v.t.*** دەرکردنی پارێزەرێك لە یەکێتی پارێزەران؛ قەدەغەکردنی پارێزەرێك لە پارێزەری کردن (لەبەر کردەوەی ناپەسەند).

**-disbarment *(n.).***

**disbelief** (dis′bi-lēf′), ***n.*** بڕوانەکردن؛ بێ بڕوایی.

**disbelieve** (dis′bi-lēv′), ***v.t. & v.i.*** بڕوانەکردن؛ بڕوا پێ نەبوون

**disburden** (dis-bũr′d′n), ***v.t.*** (١) بار لە کۆل کردنەوە؛ بار داگرتن. (٢) لە کۆل کردنەوە (شتی ناخۆش)؛ ڕزگارکردن

***( to ~ one's mind of something)***

***v.i.*** لە کۆل خۆ کردنەوە؛ خۆ لێ ڕزگارکردن

**-disburdenment *(n.).***

**disburse** (dis-bũrs′), ***v.t.*** پارە خەرج کردن؛ پارەدان.

**-disbursable *(n.).***

**disbursement** (dis-bũrs′mənt), ***n.*** (١) پارە خەرج کردن؛ پارەدان. (٢) خەرجی؛ پارەی خەرج کراو

**disc** (disk), ***n.*** = disk.

**discalced** (dis-kalst′), ***adj.*** پێپەتی (ئەندامی دەستەی ئاینی تایبەتی)

**discard** (dis-kärd′), ***v.t.*** (١) فڕێدانی کاغەزی نەویستراو (یاری یا قومار). (٢) فڕێدان (شتی بێ کەلك و نەویستراو)؛ واز لێ هێنان؛ فت کردن.

***n.*** (١) فڕێدان. (٢) شتی فڕێدراو؛ کەسێکی واز لێ هێنراو یا فت کراو. (٣) کاغەزی فڕێدراو (یاری، قومار).

**discern** (di-zũrn′, di-sũrn′), ***v.t.*** (١) جیاکردنەوە لە مێشکدا (شتێك لە شتێکی تر). (٢) هەستپێکردن؛ بینین؛ ڕێ بەدی کردن

***v.i.*** جیاکردنەوە لە مێشکدا؛ هەستکردن بە جیاوازی.

**discernible** (di-zũrn′ə-b′l, di-sũrn′ə-b′l), ***adj.*** دیار؛ بینراو؛ هەستپێکراو؛ سەرنج ڕاکێش ***( a ~ difference)*** .

**-discernibly *(adv.).***

**discerning** (di-zũrn′iŋ, di-sũrn′iŋ), ***adj.*** ڕێ بەدیپیکەر؛ وریا؛ چاوتیژ؛ هەست تیژ: ***( a ~ individual)*** .

**discernment** (di-zũrn′mənt, di-sũrn′mənt), ***n.*** (١) بینین؛ هەستپێکردن. (٢) ڕێ بەدیپی؛ چاوتیژی؛ هەست تیژی؛ زرنگی.

**discharge** (dis-chärj′), ***v.t.*** (١) دەرچوون (لە سوپا)؛ دەرکردن: ***( He was ~d from the army.)***

(٢) (أ) بار سووك کردن؛ بارداگرتن (پاپۆڕ)؛ لە کۆل کردنەوە.

(ب) تەقاندن: ***( to ~ a gun)*** .

(ج) بەرەلاکردن (لە بەندیخانە)؛ بەردان: ***( to ~ from prison)*** .

(د) دەرکردن (فرمان، کار)؛ لێخستن: ***( He was ~d from his job.)*** .

(ھ) دەرچوون (لە خەستەخانە)؛ بەردان: ***( to ~ from hospital)*** .

(و) لێخۆشبوون (قەرزار). (ز) ناوپاکردنەوە (لە گومانباری).

(٣) دەردان (کێم، خوێن)؛ لێ هاتنەدەرەوە؛ لێهاتن.

(٤) جێبەجێکردن؛ بەجێهێنان ***( to ~ one's responsibility)*** .

(٥) ڕەنگ لێ لابردن (جل و بەرگ). (٦) ووزە لێ لابردن (باتری).

(٧) لە بەرپرسیاری یا قەرز ڕزگارکردن.

***v.i.*** (١) لە کۆل بوونەوە. (٢) بەرەلابوون؛ بەربوون (٣) تەقین: ***( The gun ~d.)*** . (٤) دەردان (کێم)؛ لێ هاتنەدەرەوە؛ لێهاتن.

***n.*** (١) بەربوون؛ بەرەلاکردن؛ ڕزگاربوون. (٢) دەرکردن؛ لێخستن؛ دەرکران. (٣) بڕوانامەی لە سوپا دەرچوون یا دەرکران: ***( ~ papers)*** . (٤) تۆماری ماوەی فرمانی کەشتیەوانێك. (٥) کێم؛ پیسایی‌یەك کە لە برین دێت. (٦) پریشکی کارەبایی؛ تەزووی بەرەلاکراو.

**disciple** (di-sī′p′l), ***n.*** (١) قوتابی؛ شاگرد؛ پەیڕەوکەر. (٢) یەکێك لە دوانزە قوتابی‌یەکەی عیسا؛ شوێن کەوتوویەکی زووی عیسا

**discipleship** (di-sī′p′l-ship′), ***n.*** (١) قوتابی‌یەتی؛ شاگردێتی. (٢) ماوەی قوتابی‌یەتی

**disciplinarian** (dis′ə-pli-nâr′i-ən), ***adj.*** تایبەتی بە زەبروزۆنگ و توندوتیژی؛ سزایی.

***n.*** (١) کەسێکی بە زەبروزۆنگ؛ کەسێکی توندوتیژ. (٢) کەسێك کە بڕوای بە زەبروزۆنگ هەبێت.

**disciplinary** (dis′ə-pli-ner′i), ***adj.*** سزایی؛ هی دابینکردن: ***( to take ~ action or measures; ~ punishment)***

**discipline** (dis′ə-plin), ***n.*** (١) بەشێك لە بەشەکانی زانست. (٢) زەبروزۆنگ؛ توندوتیژی. (٣) سزا. (٤) پەیڕەو (٥) لەسەر پەیڕەو ڕۆیشتن؛ ملدان. (٦) دابینکردن؛ ڕێك وپێکی؛ ڕاگرتن.

***v.t.*** (١) دابینکردن؛ بە زەبروزۆنگ لەگەلدا جوولانەوە؛ ڕاهێنان بە توندوتیژی. (٢) سزادان؛ سەرزەنشت کردن.

**disclaim** (dis-klām′), ***v.t.*** (١) وازهێنان لە ماف؛ دەست هەلگرتن لە ماف. (٢) حاشاکردن؛ دان پێدا نەنان

**-disclamation *(n.).***

**disclaimer** (dis-klām′ẽr), ***n.*** (١) وازلێهێنان؛ دەست لێ هەلگرتن (٢) حاشایی؛ حاشاکردن.

**disclose** (dis-klōz′), ***v.t.*** ئاشکراکردن؛ دەرخستن؛ خستنەڕوو؛ درکاندن (نهێنی)؛ هەلمالین

***n.* [Obs.].** ئاشکراکردنێك؛ دەرخستنێك

**disclosure** (dis-klō′zhẽr), ***n.*** (١) ئاشکراکردن؛ دەرخستن؛ ئاشکرابوون؛ کەوتنەڕوو؛ هەلمالین. (٢) شتێکی ئاشکراکراو یا خراوەڕوو

**discoid** (dis′koid), ***adj.*** خەپلەیی.

***n.*** شتێکی خەپلەیی؛ خەپلە.

**discolor** (dis-kul′ẽr), ***v.t.*** ڕەنگ تێکدان؛ ڕەنگ گۆڕین؛ لەکەدارکردن؛ پیس کردن.

**discoloration** (dis-kul′ẽr-ā′shən), ***n.*** (١) ڕەنگ تێکدان؛ ڕەنگ تێکچوون؛ لەکەدارکردن؛ پیس بوون. (٢) لەکە.

**discomfit** (dis-kum′fit), ***v.t.*** (١) بەزاندن؛ شکاندن؛ ڕاونان. (٢) نەخشەتێکدان؛ نائومێدکردن؛ کۆسپ لەبەردەمدا دانان (٣) سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان.

**discomfiture** (dis-kum′fi-chẽr), ***n.*** (١) بەزان؛ بەزین؛ شکان؛ نائومێدی. (٢) پشێوی؛ سەر لێ شێوان؛ تەریق بوونەوە؛ شەرمەزاری.

**discomfort** (dis-kum′fẽrt), ***n.*** (١) بێ ئاسوودەیی؛ ناخۆشی؛ ناڕەحەتی؛ ئازار. (٢) هۆی بێ ئاسوودەیی، ناخۆشی، یا ئازار.

***v.t.*** بێ ئاسوودەکردن؛ ناڕەحەت کردن؛ ئازاردان.

**discompose** (dis′kəm-pōz′), ***v.t.*** (١) شلەژاندن؛ وورووژاندن؛ ئالۆزاندن؛ پەستکردن؛ سەر لێ تێکدان (٢) شێواندن؛ تێکدان؛ ناڕێك وپێك کردن.

**discomposure** (dis′kəm-pō′zhẽr), ***n.*** شلەژان؛ شلەژاوی؛ پشێوی؛ شێواوی؛ تەریق بوونەوە؛ سەر لێ شێوان

**disconcert** (dis′kən-sũrt′), ***v.t.*** (١) نەخشە یا پلان تێکدان؛

شێواندن پلان (٢) سەر لێ شێواندن؛ شڵەژاندن؛ پەستکردن؛ تەریق کردنەوە.
**-disconcerting** *(adj.)*; **disconcertingly** *(adv.)*;
**disconcerted** *(adj.)*.
**disconnect** (dis´kə-nekt′), *v.t.* (١) لەیەك جیاکردنەوە؛ پچڕاندن؛ لەیەك ترازاندن؛ پەیوەندی بڕین. (٢) بڕینی تەزووی کارەبا.
**disconnected** (dis´kə-nek′tid), *adj.* (١) بێ پەیوەندی؛ پچڕاو؛ لەیەك تراراو یا جیابووەوە؛ لەیەك کراوە.
(٢) پچڕپچڕ (نووسین، دووان)؛ لەگەڵ یەك نەگونجاو.
**disconnection** (dis´kə-nek′shən), *n.* (١) لەیەك جیاکردنەوە؛ لەیەك پچڕاندن یا بڕین. (٢) جیابوونەوە؛ بێ پەیوەندی.
**disconsolate** (dis-kon′sə-lit), *adj.* (١) غەمبار؛ غەمگین؛ بێ ئومێد (٢) ناخۆش؛ پەستکەر؛ تاریك؛ ئاسوودەنەبەخش.
**discontent** (dis´kən-tent′), *adj.* بەگلەیی لە ژیان؛ نارازی لە ژیان.
*n.* نارەزایی؛ بەدڵ نەبوون؛ بێ ئارامی و بەدوای شتی تازەو جیاوازدا گەڕان؛ بەگلەیی بوون لە ژیان
**discontentment** (dis´kən-tent′mənt), *n.* بەگلەیی‌بەتی لە ژیان؛ نارەزایی لە باری ژیان
**discontinuance** (dis´kən-tin′ū-əns), *n.* (١) وەستاندن؛ وەستان؛ بەردەوام نەبوون (٢) بڕینەوە یا وەستاندنی کاتی داوا (دادگا).
**discontinuation** (dis´kən-tin´ū-ā′shən), *n.* = **discontinuance.**
**discontinue** (dis´kən-tin′ū), *v.t.* (١) وەستاندن؛ بەردەوام نەبوون؛ بڕین؛ دوایی پێ هێنان؛ وازهێنان (٢) بڕینەوە یا وەستاندنی کاتی داوا (دادگا).
*v.i.* وەستان؛ دوایی هاتن.
**discontinuity** (dis´kon-tə-nōō′ə-ti, dis´kon-tə-nū′ə-ti),
*n.* (١) پچڕپچڕی (نووسین، دووان)؛ بێ پەیوەندی. (٢) بەردەوام نەبوون
(٣) بۆشایی
**discontinuous** (dis´kən-tin′ū-əs), *adj.* پچڕپچڕ؛ ناوبەناو؛ دەمدەمی
**discord** (dis′kôrd), *n.* (١) ناکۆکی؛ نەگونجان؛ ڕێك نەکەوتن.
(٢) دەنگەدەنگ؛ بەیەکدادانی دەنگ؛ غەڵبەغەڵب
(٣) ناسازی (دەنگ)؛ نەگونجان لەگەڵ یەکتردا (ئاواز)؛ یەك نەگرتن.
*v.i.* نەگونجان؛ بەیەکدادان؛ ناکۆکی بوون؛ نەسازان
**discordance** (dis-kôr′d'ns), *n.* ناکۆکی؛ نەگونجان؛ ڕێك نەکەوتن؛ جیاوازی؛ ناسازی.
**discordancy** (dis-kôr′d'n-si), *n.* = **discordance.**
**discordant** (dis-kôr′d'nt), *adj.* (١) ناکۆك؛ ڕێك نەکەوتوو؛ نەگونجاو لەگەڵ یەکتردا. (٢) ناساز (دەنگ، ئاواز)؛ ناخۆش (دەنگ)؛ لەگەڵ یەك نەگونجاو (دەنگ، ئاواز).
**discotheque** (dis′kə-tek), *n.* هۆڵی سەماکردن (بە مۆسیقای تۆمارکراوەوە)؛ سەماخانە
**discount** (dis′kount), *n.* (١) نرخ شکاندن (شتومەکی فرۆشگا)؛ نرخ داشکان؛ نرخی شکاو (٢) نرخ شکاندن یا هێنانەخوارەوەی کۆمپیالەیەك کە خاوەنەکەی پێش کاتی خۆی دەیگۆڕێتەوە
*v.t.* (١) نرخ شکاندن؛ نرخ هێنانەخوارەوە.
(٢) لێ دەرکردن؛ گۆڕینەوەی کۆمپیالەیەك بە کەمتر لە نرخەکەی خۆی
(٣) گوێ پێ نەدان؛ بڕوا پێ نەکردن؛ گومان لێکردن؛ بایەخ پێ نەدان:
*( You have to ~ the stories you hear.)*
*v.i.* پارە بە قەرزدان و پێشەکی لێ دەرکردنی قازانجەکە.
**at a discount,** بە کەمتر یا هەرزانتر لە نرخی خۆی؛ بە نرخی داشکاو
**discountenance** (dis-koun′tə-nəns), *v.t.* (١) تەریق کردنەوە؛ شەرمەزارکردن؛ خەجاڵەت کردن؛ ڕووڕەش کردن
(٢) پەسەند نەکردن؛ بەدڵ نەبوون؛ پێ ناخۆش بوون؛ ڕوو پێ نەدان.
**discourage** (dis-kūr′ij), *v.t.* (١) (أ) ساردکردنەوە؛ هان نەدان؛ وورە پێ بەردان *( Don't let one failure ~ you!)*
(ب) ڕوو پێ نەدان: *( She ~d her.)*.
(٢) هەوڵی وەستاندن دان (مرۆڤ لە کردەوەیەکی ناپەسەند)؛ ساردکردنەوە؛ هان نەدان؛ خاوکردنەوە:
*( We tried to ~ him for quitting his job.)*
**discouragement** (dis-kūr′ij-mənt), *n.* (١) ساردکردنەوە؛ وورە بەردان. (٢) شتێکی ساردکەرەوە یا هان نەدەر.
**discouraging** (dis-kūr′ij-iŋ), *adj.* دڵ ساردکەرەوە؛ پشت ساردکەرەوە؛ ناخۆش؛ سارد: *( ~ results, or news)*.
**discourse** (dis′kôrs, dis′kōrs), *n.* (١) گفتوگۆ؛ ئاخاوتن؛ دەمەتەقێ. (٢) ئاخاوتن وەك لقێکی زانستی.
(٣) باس؛ لێکۆڵینەوە؛ ووتار یا نووسراوێکی دووروودرێژ دەربارەی باسێك.
(٤) [Archaic]، تێگەیشتن؛ توانای تێگەیشتن.
*v.i.* (١) گفتوگۆکردن؛ ئاخاوتن؛ دووان.
(٢) ( ~ on; ~ upon )، نووسین دەربارە؛ نووسین لەسەر باسێك.
*v.t.* دەرپەڕاندن (ووتە)؛ دەربڕین؛ ووتن.
**discourteous** (dis-kūr′ti-əs), *adj.* بێ ئەزاکەت؛ بێ ئەدەب؛ ناشرین (ڕەووشت)؛ بەدڕەفتار: *( ~ behavior; a ~ person)*.
**discourtesy** (dis-kūr′tə-si), *n.* (١) بێ ئەزاکەتی؛ بێ ئەدەبی؛ ناشرینی (ڕەووشت). (٢) کردەوە یا ووتەیەکی بێ ئەزاکەتانە.
**discover** (dis-kuv′ẽr), *v.t.* (١) دۆزینەوە (شوێن، شت):
*( Christopher Columbus ~ed America.)*
(٢) بۆدەرکەوتن؛ بینین:
*( We ~ed it was too late to catch the train.)*
(٣) [Archaic]، خستنەڕوو؛ دەرخستن؛ هەڵماڵین؛ ئاشکراکردن
**discoverer** (dis-kuv′ẽr-ẽr), *n.* دۆزەرەوە.
**discovert** (dis-kuv′ẽrt), *adj.* بێ مێرد: بێوەژن، ژنی تەڵاقدراو، یا گەورەکچی شوونەکردوو.
**discovery** (dis-kuv′ẽr-i), *n.* (١) دۆزینەوە (زانست، شوێن... هتد).
(٢) شتێکی دۆزراوە؛ دۆزراوەیەك. (٣) بۆدەرکەوتنێك.
**discredit** (dis-kred′it), *v.t.* (١) بڕوانەکردن؛ بڕوانەبوون.
(٢) گومان لێکردن؛ گومان لێ بوون.
(٣) ناوبانگ شکاندن؛ ناوپیس کردن؛ لەکەدارکردن.
*n.* (١) گومان؛ بێ بڕوایی. (٢) ڕووڕەشی؛ شەرمەزاری؛ خەجاڵەتی
(٣) ڕووڕەشکەر؛ شەرمەزارکەر؛ خەجاڵەتکەر.
**discreditable** (dis-kred′it-ə-b'l), *adj.* شەرمەزارکەر؛ ناشرین (کردەوە، ڕەفتار)؛ ڕووڕەشکەر؛ خەجاڵەتکەر.
**discreet** (dis-krēt′), *adj.* (١) نهێنی پارێز؛ ووریا؛ ئاگا لە زمان و کردەوەی خۆبوو. (٢) ووریا. (٣) خاکی؛ بێ فیز؛ خۆدەرنەخەر؛ خۆنەنوێن.
**-discreetly** *(adv.)*; **discreetness** *(n.)*.
**discrepancy** (dis-krep′ən-si), *n.* (١) جیاوازی؛ ناکۆکی؛ نەگونجان: *( There was a lot of ~ between the two accounts of the battle.)*
(٢) جیاوازی‌یەك؛ ناکۆکی‌یەك.
**discrepant** (dis-krep′ənt), *adj.* جیاواز؛ ناکۆك؛ لەگەڵ نەگونجاو.
**discrete** (dis-krēt′), *adj.* (١) جیا؛ جیاواز؛ بێ پەیوەندی؛ پچڕپچڕ.
(٢) هەمەچەشن؛ هەمەڕەنگ؛ جیا جیا.
**discretion** (dis-kresh′ən), *n.* (١) سەلیقە؛ وورییایی.
(٢) دەسەڵاتی بڕیاردان بەپێی بۆچوون و لێکدانەوەی خۆ.
**at one's discretion,** بە سەلیقەی خۆ؛ بە بۆچوون و لێکدانەوەی خۆ.
**discretional** (dis-kresh′ən-'l), *adj.* = **discretionary.**
**discretionary** (dis-kresh′ə-ner´i), *adj.* بەپێی بۆچوون و سەلیقەی خۆ.
**discriminate** (dis-krim′ə-nāt´), *v.t.* لەیەك جیاکردنەوە؛ جیاوازی کردن؛ پاك‌وپیس کردن.
*v.i.* (١) لەیەك جیاکردنەوە.

(٢) جیاوازی کردن (لەگەڵ جووڵانەوە)؛ ~ against; ~ in favor of
لایەنگرتن؛ دژبوون:
***( The law is said not to ~ against the poor or in favor of the rich.)***
***adj.*** (١) جیا؛ جیاواز (٢) جیاکەرەوە؛ هەڵبژێر؛ تێگەیشتوو
**-discriminative** *(adj.).*
**discriminating** (dis-krim′ə-nāt′iŋ), *adj.* (١) جیاکەرەوە؛
پاك‌وپیس کەر؛ بەدیکەر: ***( a ~ taste in music, literature, or food)*** .
(٢) لایەنگر؛ جیاوازیکەر لەنێواندا: ***( a ~ tariff)*** .
**discrimination** (dis-krim′ə-nā′shən), *n.* (١) جیاکردنەوە؛
جیاوازی؛ جیاکاری. (٢) ڕێ بەدیی؛ تێگەیشتن؛ بینینی جیاوازی بچووك.
(٣) بە چاوی جیاوازی سەیرکردن: (ا) خاترگرتن، لایەنگری.
(ب) دژبوون. دژ وەستان، جیاوازی لەگەڵ کردن:
***( ~ against blacks in America)***
**discriminator** (dis-krim′ə-nā′tēr), *n.* جیاکەرەوە؛
جیاوازیکەر؛ لایەنگر.
**discriminatory** (dis-krim′ə-nə-tôr′i, dis-krim′ə nə-tō′ri), *adj.* (١) بە چاوی جیاوازی سەیرکەر؛ لایەنگری کوێرانە؛ دژ بوون:
***( ~ practices towards minorities)***
(٢) جیاکەرەوە؛ جیاوازیکەر.
**discursive** (dis-kũr′siv), *adj.* (١) پڕ لە هەڵبەزودابەز؛ پچڕپچڕ؛
لە باس لادەر: ***( ~ writing)*** .
(٢) بەدەرکەوتوو لەڕێی لێکدانەوەو ژیربێژییەوە نەك لەڕێی هۆشی سرووشتی و زگماکییەوە.
**discus** (dis′kəs), *n.* (١) حەپلەیەکی ئاسن یا بەردە لە ملەملێی بەهێزیدا دەهاوێژرێت (وەرزش). (٢) فڕێدان یا هاویشتنی ئەم جۆرە حەپلەیە (هەروەها پێشی دەووترێ: **discus throw**).
**discuss** (dis-kus′), *v.t.* (١) لێکۆڵینەوە؛ باسکردن (بە نووسین)؛
لەسەر نووسین؛ نووسین دەربارە.
(٢) گفتوگۆکردن دەربارەی؛ باسکردن (دووان)
***( to ~ a problem with somebody)***
**discussion** (dis-kush′ən), *n.* لێکۆڵینەوە؛ باسکردن؛ باس؛
[illegible] گفتوگۆ
**under discussion,** لێی دەکۆڵرێتەوە؛ باس دەکرێت؛
گفتوکۆی لەسەر دەکرێت
**disdain** (dis-dān′), *v.t.* بە سووك سەیرکردن؛ ڕق لێ بوونەوە؛
بێز لێ هاتنەوە؛ بە نزم و بێ بایەخ دانان:
***( It is wrong to ~ a man merely because he is poor.)***
***n.*** بە سووك سەیرکردن؛ لووت بەرزی؛ دوورەپەرێزی؛ بێزنەهاتن:
***( to look at with ~ )***
**disdainful** (dis-dān′fəl), *adj.* بە سووك سەیرکەر؛ لووت بەرز؛
بەفیز؛ دوورەپەرێز: ***( a ~ person)*** .
**disease** (di-zēz′), *n.* (١) نەخۆشی؛ دەرد؛ درم
(٢) بەدی؛ نەخۆشی کەسی یا کۆمەڵایەتی:
***( Bigotry is a ~ of society)***
***v.t.*** نەخۆش خستن؛ تێکدان؛ خراپ کردن
**diseased** (di-zēzd′), *adj.* (١) نەخۆش؛ دەردەدار
(٢) تێکچوو؛ نائاسا؛ نەخۆش؛ شێت: ***( a ~ mind)*** .
**disembark** (dis′im-bärk′), *v.t.* بارداگرتن لە پاپۆڕ (مرۆڤ، شت)
***v.i.*** دابەزین لە پاپۆڕ
**-disembarkation** *(n.).*
**disembody** (dis′im-bod′i), *v.t.* ڕزگارکردنی گیان لە لەش؛
گیان لە لەش جیاکردنەوە: ***( a ~ied spirit)*** .
**-disembodied** *(adj.)*; **disembodiment** *(n.).*
**disembowel** (dis′im-bou′əl, dis′im-boul′), *v.t.* ڕیخۆڵە-
دەرهێنان؛ ڕیخۆڵە لێکردنەوە.
**-disembowelment** *(n.).*
**disenchant** (dis′in-chant′. dis′in-chänt′), *v.t.* لە هەڵەو
خەیاڵ پلاوی ڕزگارکردن؛ چاوکردنەوەو ڕاستی نیشاندان؛ بێ تاقەت کردن
**-disenchanted** *(adj.)*; **disenchantment** *(n.).*
**disencumber** (dis′in-kum′bēr), *v.t.* بار لە کۆڵ کردنەوە؛
بار سووك کردن؛ ڕزگارکردن (لە کێشەیەکی قورس و ناخۆش)
**disenfranchise** (dis′in-fran′chīz), *v.t.* = **disfranchise.**
**disengage** (dis′in-gāj′), *v.t.* لەیەك جیاکردنەوە؛ لەیەککردنەوە؛
بەرەڵاکردن؛ ڕزگارکردن (لە پەیمان، بەسترانەوە، یا بارێك)؛ ڕەهاکردن؛
کشاندنەوە؛ گرێ کردنەوە.
***v.i.*** بەرەڵابوون؛ ڕەهابوون؛ ڕزگاربوون؛ لێ جیابوونەوە
**disengaged** (dis′in-gājd′), *adj.* (١) دەستبەتاڵ؛ بێ ئیش‌وکار.
(٢) بەرەڵا؛ سەربەست؛ نەبەستراوە.
**disengagement** (dis′in-gāj′mənt), *n.* (١) بەرەڵایی؛ ڕزگاربوون؛
لەیەککردنەوە؛ ڕەهاکردن؛ بەردان؛ خۆکشاندنەوە؛ گرێ کردنەوە.
(٢) بێ ئیش‌وکاری؛ دەستبەتاڵی.
**disentangle** (dis′in-taŋ′g'l), *v.t.* لەیەك جیاکردنەوە؛
کردنەوە (گرێ)؛ لە ئاڵۆسکاوی ڕزگارکردن؛ لەیەککردنەوە؛ ڕوونکردنەوە
***( to ~ truth from falsehood)***
***v.i.*** ڕزگاربوون؛ لە ئاڵۆزی ڕزگاربوون.
**-disentanglement** *(n.).*
**disenthrall, disenthral** (dis′in-thrôl′), *v.t.* ئازادکردن؛
لە بەندایەتی ڕزگارکردن
**disenthrone** (dis′in-thrōn′), *v.t.* لە تەختی پاشایی لابردن یا
هێنانەخوارەوە.
**disentomb** (dis′in-toom′), *v.t.* لە گۆڕ هێنانەدەرەوە
**disentwine** (dis′in-twīn′), *v.t.* لەیەك جیاکردنەوە؛ کردنەوە (گرێ، ئاڵۆزی)؛ لە ئاڵۆسکاوی ڕزگارکردن.
**disestablish** (dis′ə-stab′lish), *v.t.* (١) کشاندنەوەی لایەنگری و
پاڵپشتی کردنی فەرمانڕەوایی بۆ کڵێسەیەك
(٢) گۆڕینی بارێکی چەسپیو یا دامەزراو
**-disestablishment** *(n.).*
**disesteem** (dis′ə-stēm′), *v.t.* ڕێزنەگرتن؛ بە سووك سەیرکردن؛
بە چاوی نزم تەماشاکردن.
***n.*** بە سووك سەیرکردن؛ ڕێزنەگرتن؛ بێ ڕێزی: ***( to hold in ~ )*** .
**disfavor** (dis-fā′vēr), *n.* (١) ناپەسەندی؛ نەویستن؛ بەدڵ نەبوون؛
خۆش نەویستن؛ قین. (٢) ڕێز لێ نەگیران؛ بە سووك سەیرکران؛ لەبەرچاو شکان
***( to be in ~ with someone; He fell into ~ with his patron.)***
***v.t.*** بەدڵ نەبوون؛ نەویستن؛ پەسەند نەکردن؛ بە سووك سەیرکردن.
**disfigure** (dis-fig′yēr), *v.t.* شێوە تێکدان؛ ڕووخسار شێواندن؛
دیمەن شێواندن؛ لەکەدارکردن (ڕواڵەت)؛ شێواندن.
**-disfiguration** *(n.).*
**disfigurement** (dis-fig′yēr-mənt), *n.* (١) شێوە تێکدان؛
دیمەن شێواندن. (٢) ڕووخسار تێکچوون؛ شێوە تێکچوون.
(٣) لەکە؛ شێوەتێکدەر؛ خەوش.
**disforest** (dis-fôr′ist, dis-for′ist), *v.t.* = **deforest.**
**disfranchise** (dis-fran′chīz), *v.t.* (١) مافی هاووڵاتێتی لێ
سەندنەوە (وەك مافی دەنگدان یا خۆپاڵاوتن)
(٢) ماف لێ سەندنەوە؛ دەسەلات لێ سەندنەوە.
**-disfranchised** *(adj.)*; **disfranchisement** *(n.).*
**disfrock** (dis-frok′), *v.t.* لە قەشەیەتی خستن یا دەرکردن.
**disgorge** (dis-gôrj′), *v.t. & v.i.* (١) ڕشانەوە؛ هێنانەوە
(٢) بە نابەدڵی وازهێنان لە شتێکی بە ناڕەوا دەستکەوتوو.
(٣) تێڕژاندن؛ خاڵی کردنەوە؛ خۆبەتاڵکردنەوە.

**disgrace** (dis-grās′), *n.* (١) شەرمەزاری؛ شووره‌یی؛ ڕووڕەشی؛
خەجاڵەتی ***( to be in ~ )***
(٢) ڕووڕەشکەر (مرۆڤ، شت)؛ ئابڕووبەر.
***v.t.*** شەرمەزارکردن؛ لەکەدارکردن؛ ڕووڕەش کردن؛ ئابڕووبردن.
**disgraceful** (dis-grās′fəl), *adj.* شەرمەزارکەر؛ شووره‌یی؛
ئابڕووبەر؛ زۆر ناشرین (کردەوە): ***( a ~ act)*** .
**disgruntle** (dis-grun′t'l), *v.t.* پەستکردن؛ داخ پێدان (بەهۆی
بە ناڕەوایی لەگەڵ جووڵانەوە)؛ تووڕەکردن.
**disgruntled** (dis-grun′t'ld), *adj.* پەست؛ داخ نەدڵ (بەهۆی
ناڕەوایییەکەوە)؛ تووڕە (لە ڕژێم، کاربەدەستان، سەرکار... هتد).
**disguise** (dis-gīz′), *v.t.* (١) گۆڕین؛ خۆگۆڕین؛ دەماخ کردن:
***( D~ your voice.)***
(٢) شاردنەوە؛ داپۆشین ***( She ~d her hatred.)*** .
**disguise** (dis-gīz′), *n.* (١) خۆگۆڕین؛ ڕووخسار گۆڕین؛ دەماخ کردن.
(٢) ڕووالەت؛ ڕووخساری درۆ
(٣) ئەو جل‌وبەرگ و ئارایشتەی لە ڕووخسار گۆڕیندا بەکاردەهێنرێت.
**disgust** (dis-gust′), *n.* قێز؛ قێزکردنەوە؛ بێزاری؛ بێز؛
ڕق لێ بوونەوە ***( She was filled with ~ .)*** .
***v.t.*** قێز لێ هاتنەوە؛ ڕق لێ بوونەوە؛ بێزارکردن: ***( You ~ me.)*** .
**disgustful** (dis-gust′fəl), *adj.* = **disgusting.**
**disgusting** (dis-gus′tiŋ), *adj.* بۆگەن؛ پیس؛ ناپەسەند؛
مرۆڤ قێزی لێ دێتەوە
**dish** (dish), *n.* (١) دەوری؛ قاپ؛ دەفری نان تێدا خواردن.
(٢) خۆراك؛ خواردن ***( a favorite ~ )*** .
(٣) پڕ قاپێك؛ پڕ دەورییەك خواردن. (٤) شتێکی لە قاپ چوو.
(٥) (ا) قوپاوییەکی وەك قاپ. (ب) ئەندازەی ئەم قوپاوییە.
(٦) [Colloq.]. شتێك کە مرۆڤ زۆر بەدڵی بێت: ***( Physics is my ~ .)***
***v.t.*** (١) ( ~ up; ~ out ) خواردن کردنە قاپ یا دەفرەوە؛ خواردن تێکردن.
(٢) قوپاندن وەك قاپ. (٣) [British Spelling]. سەر لێ شێواندن؛ تێکدان؛
سەرسووڕماندن؛ خەڵەتاندن.
***v.i.*** قوپان
**dish it out,** [Slang]. سزادان
**disharmonious** (dis′här-mō′ni-əs), *adj.* نەگونجاو؛ ناکۆك؛
نەساز؛ لەگەڵ یەك ڕێك نەکەوتوو
**disharmonize** (dis-här′mə-nīz′), *v.t. & v.i.* نەگونجاندن؛
ناکۆکی خستنە نێوانەوە؛ نەسازاندن؛ تێکدان.
**disharmony** (dis-här′mə-ni), *n.* نەگونجان؛ ناکۆکی؛ نەسازان؛
پێکەوە ڕێك نەکەوتن
**dishcloth** (dish′klôth′, dish′kloth′), *n.* پەڕۆی قاپ شتن
**dishearten** (dis-här′t'n), *v.t.* دڵ ساردکردنەوە؛ پەستکردن؛
دڵشکست کردن؛ دڵ گرتن
-**disheartenment** *(n.)*.
**dishevel** (di-shev′'l), *v.t.* قژ بژکردنەوە؛ ژاکاندن و تێکدان (جل‌و-
بەرگ)؛ چرچ‌ولۆچ کردن و تێکدان
-**dishevelment** *(n.)*.
**disheveled, dishevelled** (di-shev′'ld), *adj.* بژ (قژ)؛
چرچ‌ولۆچاوی و شێواو (بەرگی کەسێك)؛ ژاکاو و تێکچوو؛ پنتی.
**dishful** (dish′fool′), *adj.* پڕ قاپێك (خواردەمەنی).
**dishonest** (dis-on′ist), *adj.* ناپاك؛ ساختەچی ***( a ~ man)*** .
**dishonesty** (dis-on′is-ti), *n.* ناپاکی؛ ساختەچێتی؛ سەرچەوتی
**dishonor** (dis-on′ēr), *n.* (١) شەرمەزاری؛ بێ شەرەفی؛ بێ ناموسی؛
بێ ئابڕوویی؛ ڕووڕەشی (٢) شتێك یا کەسێك کە ڕووڕەشی و شەرمەزاری
بەسەر مرۆڤدا دەهێنێت. (٣) سەرچەوتی لە قەرزدانەوەدا.
***v.t.*** (١) شەرمەزارکردن؛ سووك کردن؛ ناموس بردن؛ ڕووڕەش کردن؛
ئابڕووبردن (٢) بێ بن کردن؛ ئابڕووبردنی کچ یا ژن.
(٣) قەرزنەدانەوە؛ سەرچەوتی کردن لە دانەوەی قەرزدا.
**dishonorable** (dis-on′ēr-ə-b'l), *adj.* بێ شەرەف؛ بێ ناموس؛
سووك؛ بێ ئابڕوو؛ سەرشۆڕ؛ نامەرد؛ ناپاك: ***( a ~ act, or person)*** .
-**dishonorably** *(adv.)*.
**dishpan** (dish′pan′), *n.* دەفری قاپ‌وقاجاخ تێدا شتن.
**dishrag** (dish′rag′), *n.* = **dishcloth.**
**dishtowel** (dish′tou′l, dish′toul′), *n.* پەڕۆی قاپ‌وقاجاخ
ووشك کردنەوە.
**dishwasher** (dish′wôsh′ēr, dish′wosh′ēr), *n.* مەکینەی
قاپ‌وقاجاخ شتن.
**dishwater** (dish′wô′tēr, dish′wot′ēr), *n.* ئەو ئاوەی قاپ‌و-
قاجاخی تێدایە یا تێیدا شۆراوە
**disillusion** (dis′i-lōō′zhən, dis′i-lū′zhən), *v.t.* لە هەڵەو
خەیاڵ پڵاوی ڕزگارکردن؛ چاوکردنەوەو ڕاستی پیشاندان؛ لەبەرچاوخستن؛
دڵ لێ ساردکردنەوە؛ نائومێدکردن.
*n.* لە هەڵەو خەیاڵ پڵاوی ڕزگارکردن یا ڕزگاربوون؛ چاوکردنەوەو ڕاستی بینین؛
نائومێدی.
-**disillusioned** *(adj.)*; **disillusionment** *(n.)*.
**disincentive** (dis′in-sen′tiv), *n.* هان نەدەر؛ دڵ ساردکەرەوە.
**disinclination** (dis′in-klə-nā′shən, dis-in′klə-nā′shən),
*n.* نەویستن؛ ڕق لێ بوونەوە؛ بێ مەیلی.
**disincline** (dis′in-klīn′), *v.t.* دڵ لێ ساردکردنەوە؛ مەیل پێ بڕین؛
بوون بەهۆی نەویستن.
***v.i.*** نەویستن؛ دڵ لێ ساردبوونەوە؛ مەیل نەبوون.
**disinclined** (dis′in-klīnd′), *adj.* نەویست؛ بێ مەیل؛ دڵ سارد.
**disinfect** (dis′in-fekt′, dis′'n-fekt′), *v.t.* میکرۆب کوشتن؛
پاکژکردن؛ لە میکرۆب پاکردنەوە
**disinfectant** (dis′in-fek′tənt, dis′'n-fek′tənt), *n.* پاکژکەر؛
میکرۆب کوژ (دەرمان).
**disinfection** (dis′in-fek′shən, dis′'n-fek′shən), *n.* میکرۆب
کوشتن؛ پاکژکردنەوە (لە میکرۆب)؛ خاوێن کردن.
**disinfest** (dis′in-fest′, dis′'n-fest′), *v.t.* پاکردنەوە لە مێروو و
جانەوەری زیانبەخش.
**disingenuous** (dis′in-jen′ū-əs, dis′'n-jen′ū-əs), *adj.*
نادڵسۆز؛ ساختە؛ فڕوفێڵاوی؛ ناپاك.
-**disingenuously** *(adv.)*; **disingenuousness** *(n.)*.
**disinherit** (dis′in-her′it, dis′'n-her′it), *v.t.* بێبەش کردن لە
میراتی؛ حاشالێکردن و بێبەش کردن لە میراتی.
-**disinheritance** *(n.)*.
**disintegrate** (dis-in′tə-grāt′), *v.i.* داوەشین؛ پووکانەوە؛
هەڵوەشان؛ پارچە پارچە بوون؛ داڕزین؛ ڕووخان؛ لەیەکبوونەوە؛ بۆگەن کردن
***v.t.*** داوەشاندن؛ هەڵوەشاندنەوە؛ لەیەککردنەوە؛ داڕزاندن؛ ڕووخاندن؛
پووکاندنەوە.
**disintegration** (dis-in′tə-grā′shən), *n.* (١) داوەشان؛ داڕزین؛
پارچە پارچە بوون؛ ڕووخان؛ بۆگەن کردن؛ پووکانەوە؛ لەیەکبوونەوە.
(٢) دابەشبوون یا پارچە پارچە بوونی گەرد (فیزیا).
**disinter** (dis′in-tūr′), *v.t.* (١) لە گۆڕ دەرهێنان.
(٢) خستنەڕوو؛ ئاشکراکردن؛ دەرخستن.
-**disinterment** *(n.)*.
**disinterested** (dis-in′tēr-is-tid, dis-in′tris-tid), *adj.* (١) بێ
سوودی تایبەتی خۆ؛ بێلایەن: ***( a ~ judge)*** .
(٢) [Colloq.]، بێباك؛ گوێ پێ نەدەر.
**disinvest** (dis′in-vest′), *v.t.* سەرمایە کێشانەوە.
-**disinvestment** *(n.)*.
**disjoin** (dis-join′), *v.t.* لەیەك جیاکردنەوە؛ لەیەککردنەوە.

*v.i.* لەیەك جیابوونەوە؛ لەیەکبوونەوە

**disjoint** (dis-joint′), *adj.* لەجێ‌چوو؛ لەخرتکەچوو؛ پارچەپارچەکراو

*v.t.* (١) لەجێ‌بردن؛ لەخرتکەبردن (٢) پارچەپارچەکردن.

(٣) لەیەککردنەوە لە جومگەکاندا؛ لەیەك ترازاندن

(٤) لەیەك جیاکردنەوە؛ هەڵوەشاندنەوە؛ تێکدان؛ لەیەککردنەوە.

*v.i.* (١) لەجێ‌چوون؛ لەخرتکەچوون.

(٢) لەیەکبوونەوە لە جومگەکاندا؛ لەیەك ترازان.

**disjointed** (dis-join′tid), *adj.* (١) لەجێ‌چوو؛ لەخرتکەچوو

(٢) لەیەك ترازاو؛ لەیەك جیاکراوە لە جومگەکاندا.

(٣) پارچەپارچەکراو؛ تێك‌وپێکدراو؛ شێواو.

(٤) پچڕپچڕ *( a ~ piece of writing)*.

**disjunct** (dis-juŋkt′), *adj.* پچڕاو؛ لەیەك ترازاو؛ لەیەك جیابووەوە

**disjunction** (dis-juŋk′shən), *n.* (١) لەیەك جیاکردنەوە؛ لەیەك جیابوونەوە. (٢) بیر یا ڕای دوولایەنە (ژیربێژی).

**disjunctive** (dis-juŋk′tiv), *adj.* (١) جیاکەرەوە؛ لەیەککەرەوە؛ تایبەتی بە لەیەك جیاکردنەوە

(٢) تایبەتی بە ووشەی پەیوەندی بەراووردی یا دوولایی (ڕێزمان):

**(** *Either... or*, *but*, **and** *although* **are ~ conjunctions.)**

(٣) تایبەتی بە بیر یا ڕای دوولایەنە (ژیربێژی)

*n.* (١) ووشەی پەیوەندی بەراوورد یا دوولایی (ڕێزمان) (ووشەی پێشوو ببینە).

(٢) بیر یا ڕایەکی دوولایەنە (ژیربێژی): بۆ نموونە:

**( Either all men are free, or no man is free.)**

**disk** (disk), *n. Also* disc, (١) خەپلە؛ پەپکە (وەك هی کۆمپیوتەر).

(٢) شتێکی خەپلەیی. واتە خڕو تەخت. *( the moon's ~ )*.

(٣) گوڵێکی خەپلەیی (وەك گوڵەبەڕۆژە): *( the ~ of the sunflower)*.

(٤) قەوان (٥) بەشێکی زیندووی خەپلەیی (گیانەوەرناسی).

(٦) [Obs.]. خەپلەی هاویشتن (ملەملێی وەرزشی).

**disk jockey,** کەسێکە کە پیشەی ئەوەیە لە ئێستگەی ڕادیۆ قەوان‌و شریتی موسیقا لێدەدات‌و جارجاریش نوکتەبازی دەکات‌و بڵاونامەی بازرگانی دەخوێنێتەوە

**dislike** (dis-līk′), *v.t.* حەز لێ نەکردن؛ نەویستن؛ خۆش نەویستن؛ بەدڵ نەبوون؛ بق لێ بوون.

*n.* حەز لێ نەکردن؛ بەدڵ نەبوون؛ خۆش نەویستن؛ نەویستن؛ قین؛ بق لێ بوون.

**dislocate** (dis′lō-kāt′, dis-lō′kāt), *v.t.* (١) لەجێ‌بردن؛ لەخرتکەبردن *( He ~d his shoulder.)*

(٢) لابردن؛ دەرکردن؛ گواستنەوە (بەزۆر)؛ لە جێی خۆ لابردن:

*( to ~ people from their ancestral homes)*

(٣) شێواندن؛ تێکدان

**dislocation** (dis′lō-kā′shən), *n.* (١) لەجێ‌چوون؛ لەخرتکەچوون.

(٢) لە جێی خۆ لابردن؛ لابردن؛ گواستنەوە (بەزۆر)؛ جوڵاندن:

*( the ~ of people from their land)*

(٣) شێواندن؛ تێکدان؛ تێکچوون.

**dislodge** (dis-loj′), *v.t.* جووڵاندن؛ لابردن؛ ترازاندن؛ دەرکردن.

*v.i.* جووڵان لە جێی قایمی خۆ؛ لاچوون؛ ترازان.

**-dislodgement** *(n.)*.

**disloyal** (dis-loi′əl), *adj.* نادڵسۆز بەرامبەر برادەر، ئەرکی سەرشان، وڵات)؛ ناپاك؛ بێ وەفا.

**disloyalty** (dis-loi′əl-ti), *n.* (١) نادڵسۆزی؛ ناپاکی؛ بێ وەفایی.

(٢) کردەوەیەك یا کارێکی نادڵسۆزانە.

**dismal** (diz′m'l), *adj.* (١) دڵتەنگکەر؛ لێڵ؛ ناخۆش؛ تاریك

*( What ~ weather!)*

(٢) پەست؛ غەمبار؛ غەمگین: *( Why are you looking so ~ ?)*

(٣) [Colloq.]. بێ‌فەڕ؛ قەڵب؛ خراپ: *( a ~ teacher; ~ results)*.

**dismantle** (dis-man′t'l), *v.t.* (١) ڕووتکردن؛ بەرگ لێکردنەوە

(٢) ڕووتکردنەوەی خانوو، پاپۆڕ، یا شتێکی وەها: *( to ~ a warship)*.

(٣) هەڵوەشاندن (چەك، مەکینە)؛ داگرتن (مەکینە)؛ ڕووتکردن (چەك)؛ پارچەپارچەکردن: *( to ~ an engine)*

(٤) هەڵوەشاندنەوە (ڕێکخراو، یەکێتی)؛ ئاشبەتاڵ لێکردن؛ لەکارخستن: *( to ~ an organization)*.

**dismay** (dis-mā′), *v.t.* مەترسی خستنە دڵەوە؛ ترساندن؛ سەرسام کردن.

*n.* مەترسی؛ ترس؛ سەرسامی.

**dismember** (dis-mem′bēr), *v.t.* (١) دەست‌و قاچ بڕین؛ باڵ‌و لاق لێکردنەوە. (٢) پارچەپارچەکردن (لەش، وڵات، شت)؛ دابەشکردن (وڵات)؛ لەت لەت کردن.

**-dismemberment** *(n.)*.

**dismiss** (dis-mis′), *v.t.* (١) بەرەڵاکردن؛ ئازادکردن؛ ڕێگەپێدان بە ڕۆیشتن یا بڵاوەلێکردن: *( The teacher ~ed his class early.)*

(٢) دەرکردن لە کار؛ لێخستن (لە ئیش).

(٣) لە مێشکی خۆ دەرکردن؛ گوێ پێ نەدان؛ لە بیری خۆ بردنەوە:

*( He ~ed his fears.)*

(٤) فڕێدانە دەرەوەی داوایەك لە دادگادا (لەبەر نەبوونی بەڵگە)

**dismissal** (dis-mis′'l), *n.* (١) بەرەڵاکردن؛ ئازادکردن؛ ڕێگەپێدان.

(٢) دەرکردن لە کار؛ لێخستن (لە ئیش). (٣) فەرمانی لە کار دەرکردن.

(٤) فڕێدانە دەرەوەی داوایەك لە دادگا.

**dismount** (dis-mount′), *v.i.* دابەزین (لە ئەسپ، پاسکیل... هتد).

*v.t.* (١) هێنانەخوارەوە؛ داگرتن (٢) دابەزاندن.

(٣) داگرتن (مەکینەی ئوتومبیل)؛ هەڵوەشاندن (مەکینە).

**disobedience** (dis′ə-bē′di-əns), *n.* یاخی بوون؛ لاساری؛ بە گوێ نەکردن؛ لێ هەڵگەڕانەوە؛ سەرپێچی.

**disobedient** (dis′ə-bē′di-ənt), *adj.* یاخی؛ لاسار؛ بێ گوێ؛ لێ هەڵگەڕاوە؛ سەرپێچ.

**disobey** (dis′ə-bā′), *v.t. & v.i.* یاخی بوون؛ بە گوێ نەکردن؛ بێ گوێیی کردن؛ سەرپێچی کردن؛ لێ هەڵگەڕانەوە:

*( to ~ a person, or orders)*

**disoblige** (dis′ə-blīj′), *v.t.* (١) چاکە لەگەڵ نەکردن؛ مەمنون نەکردن؛ چاوبەرەوژێر نەکردن بۆ نەکردنی ئەو کارەی ویستراوە بکرێت

(٢) تووڕەکردن؛ دڵ ئێشاندن؛ دڵ شکاندن؛ پەستکردن.

**disorder** (dis-ôr′dēr), *n.* (١) شێواوی؛ ناڕێك‌وپێکی؛ تێکچوون.

(٢) پشێوی؛ ئاژاوە؛ هەرا. (٣) نەخۆشی: *( a stomach ~ )*.

*v.t.* (١) شێواندن؛ تێکدان؛ بەسەریەکدادان. (٢) نەخۆش خستن.

**disordered** (dis-ôr′dērd), *adj.* (١) شێواو؛ ناڕێك‌وپێك؛ ناڕێك.

(٢) نەخۆش؛ تێکچوو: *( a ~ mind)*.

**disorderly** (dis-ôr′dēr-li), *adj.* (١) شێواو؛ ناڕێك‌وپێك؛ بەسەریەکدا دراو؛ تێك‌وپێکدراو؛ تێکەڵاو‌وپێکەڵاو

(٢) پشێوی خەرەوە؛ ئاژاوەگێڕ؛ ناشرین (ڕەووشت)؛ یاخی.

*adv.* بە ناڕێك‌وپێکی؛ بە تێکەڵاو‌وپێکەڵاوی؛ بە ناشرینی.

**disorderly conduct,** سەرپێچی‌یەکی بچووك (یاسا)؛ کردەوەی ناپەسەند.

**disorganize** (dis-ôr′gə-nīz′), *v.t.* شێواندن؛ تێکدان؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ کردن؛ بەسەریەکدادان.

**-disorganization** *(n.)*; **disorganized** *(adj.)*.

**disorient** (dis-ôr′i-ent′, dis-ō′ri-ent′), *v.t.* سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان؛ ڕێ پێ ونکردن.

**disorientate** (dis-ôr′i-en-tāt′, dis-ō′ri-en-tāt′), *v.t.* = **disorient.**

**disorientation** (dis-ôr′i-en-tā′shən, dis-ō′ri-en-tā′-shən), *n.* سەر لێ تێکچوون‌و نەناسینەوەی شوێن‌و کات‌و خەڵك (پزیشکەوانی دەروون)؛ سەر لێ شێوان.

**disown** (dis-ōn′), *v.t.* حاشالێکردن (خزم)؛ خۆ نەکردن بە خاوەنی؛

دەست لێ هەڵگرتن.

**disparage** (dis-par′ij), *v.t.* (١) پلەوپایە شکاندن؛ لە ڕێز کەم کردنەوە (٢) ناوبانگ پیس کردن؛ سووک کردن؛ ناوشکاندن.

**disparagement** (dis-par′ij-mənt), *n.* (١) ناوبانگ پیس کردن؛ سووک کردن؛ شکاندن؛ ناوخراپ کردن. (٢) سووکی؛ شکان؛ کەم ڕێزی.
(٣) شتێکی سووککەر (ووتە، کردەوە)؛ شتێکی ناوخراپکەر.

**disparaging** (dis-par′ij-iŋ), *adj.* سووککەر؛ لە ڕێز کەمکەرەوە؛ شکێنەر *( a ~ remark about a person or thing)*.

**disparate** (dis′pə-rit), *adj.* جیا؛ جیاواز لەیەکتر؛ ناهاوتا.

**disparity** (dis-par′ə-ti), *n.* جیاوازی (لە تەمەن، باشی، گەورەیی و بچووکی، پلەوپایە، پلە... هتد)؛ ناهاوتایی؛ لارسەنگی.

**dispassion** (dis-pash′ən), *n.* بێلایەنی؛ هێمنی؛ لەسەرخۆیی.

**dispassionate** (dis-pash′ən-it), *adj.* بێلایەن؛ هێمن؛ لەسەرخۆ.

**dispassionately** (dis-pash′ən-it-li), *adv.* بە بێلایەنانە؛ بە هێمنی؛ لەسەرخۆیانە: *( to discuss something ~ )*.

**dispatch** (dis-pach′), *v.t.* (١) ناردن (پەیامبەر، پەیام، نامە، برووسکە)؛ ڕەوانەکردن (٢) کوشتن
(٣) کردنی کارێک بە خێرایی یا گورجوگۆڵی و کارامەیی.
(٤) [Colloq.]. خواردن؛ تەواوکردن.

*n.* (١) ناردن (پەیامبەر، پەیام، نامە، برووسکە)؛ ڕەوانەکردن. (٢) کوشتن.
(٣) خێرایی؛ گورجوگۆڵی: *( to do something with ~ )*.
(٤) پەیامێکی ڕەسمی یا سوپایی.
(٥) دەنگوباس یا چیرۆکێک کە پەیامنێری ڕۆژنامە یا ڕادیۆیەک لەدوورەوە بە برووسکە دەینێرێت.

**dispatcher** (dis-pach′ẽr), *n.* (١) بکەری ( dispatch )؛ نێرەر.
(٢) کرێکارێکی کۆمپانیای گواستنەوە کە پاس و لۆری و شەمەندەفەر و تەکسی بەگوێرەی کاتی تایبەتی و پێویستی دەنێرێت؛ دەڵاڵ (کۆمپانیای گواستنەوە).

**dispel** (dis-pel′), *v.t.* نەهێشتن؛ ڕەواندنەوە؛ پەرش‌وبڵاوکردنەوە؛ لابردن *( to ~ fog, doubts or fears)*.

**dispend** (dis-pend′), *v.t.* [Obs.]. بەفیڕۆدان (پارە)؛ دەستبڵاوی کردن.

**dispensable** (dis-pen′sə-b'l), *adj.* (١) بەش دەکرێت؛ دابەش دەکرێت. (٢) دەتوانرێت دەستی لێ هەڵبگیرێ؛ ناگرنگ؛ ناپێویست.
(٣) لێخۆشبوونی بۆ هەیە (گوناه)

-dispensability *(n.)*.

**dispensary** (dis-pen′sə-ri), *n.* (١) نیمارگە لە قوتابخانە، کارگە، یا نەخۆشخانەیەکدا؛ ژووری دەرمان پێدان لەم شوێنانەدا؛ دەرمانخانە.
(٢) نیمارگە یا دەرمانخانەی گشتی کە دەرمانی بە خۆڕایی یا نرخێکی کەم تێدا دەدرێت

**dispensation** (dis′pən-sā′shən, dis′pen-sā′shən), *n.* (١) دابەشکردن؛ بەشکردن؛ بەخشینەوە. (٢) شتێکی بەشکراو یا بەخشراوە.
(٣) بەڕێوەبردن (٤) بەخشین؛ ئازادکردن لە ئەرکێک؛ بەدەرکردن؛ نەگرتنەوە (یاسا). (٥) ویستی خودا؛ بوونی دەستی خودا لە ڕووداوەکانی سەرزەویدا؛ بەڕێوەبردنی جیهان لەلایەن خوداوە
(٦) ڕێناز و یاسای ئاینی
*( The Moslem ~ differs from the Christian.)*

**dispensatory** (dis-pen′sə-tôr′i, dis-pen′sə-tō′ri), *n.* (١) پەڕتووکی گرتنەوەی دەرمان و چۆنێتی بەکارهێنانی.
(٢) [Archaic]. تیمارگە

*adj.* تایبەتی بە بەخشین

**dispense** (dis-pens′), *v.t.* (١) دابەشکردن؛ بەخشینەوە؛ پێدان
(٢) ئامادەکردن یا گرتنەوە و پێدان (دەرمان، ڕەچەتە).
(٣) جێبەجێکردن (یاسا)؛ بەسەردادان؛ بەڕێوەبردن:
*( He ~d the law justly.)*
(٤) بەخشین؛ بەدەرکردن.

**dispense with,** (١) لەناوبردن؛ فڕێدان؛ سەرنگوم کردن؛ کوشتن.
(٢) دەست لێ هەڵگرتن؛ واز لێ هێنان.

**dispenser** (dis-pens′ẽr), *n.* (١) دەرمانگرەوە؛ دەرمان ئامادەکەر.
(٢) بدەر (ئامێر): *( a water- ~ ; a paper- cup ~ )*

**dispersal** (dis-pũr′səl), *n.* بڵاوکردنەوە؛ پەرش‌وبڵاوبوونەوە؛ دابەشکردن؛ بڵاوەپێکردن؛ تەفروتوناکردن.

**disperse** (dis-pũrs′), *v.t.* (١) بڵاوکردنەوە؛ پەرش‌وبڵاوکردنەوە؛ پەرەوازەکردن؛ بڵاوەپێکردن: *( to ~ demonstrators)*.
(٢) نەهێشتن (٣) بڵاوکردنەوە: *( to ~ knowledge)*.
(٤) ڕەواندنەوەی تیشکی خۆر بۆ بەشەکانی

*v.i.* بڵاوەکردن؛ بڵاوەلێکردن؛ بڵاوبوونەوە؛ پەرش‌وبڵاوبوونەوە.

**dispersion** (dis-pũr′shən, dis-pũr′zhən), *n.* (١) بڵاوبوونەوە؛ پەرش‌وبڵاوبوونەوە یا بڵاوکردنەوە؛ بڵاوەلێکردن؛ بڵاوەپێکردن.
(٢) ڕەوینەوە یا ڕەواندنەوەی تیشکی خۆر بۆ بەشەکانی.
(٣) ڕەواندنەوەی تەووژمی کارەبایی.

**dispirit** (di-spir′it), *v.t.* پەستکردن؛ غەمبارکردن؛ دڵشکست کردن؛ وورە پێ بەردان؛ هان نەدان؛ گیان داهێزران.

**dispirited** (di-spir′it-id), *adj.* پەست؛ غەمبار؛ بێ ووزە؛ بێ تاقەت؛ بێ وورە؛ گیان داهێزراو

-dispiritedly *(adv.)*.

**displace** (dis-plās′), *v.t.* (١) لە جێی خۆ لادان؛ لابردن.
(٢) دەرکردن؛ دەربەدەرکردن؛ سەرگەردان کردن.
(٣) دەرکردن لە کار؛ لێخستن (فرمان)؛ لابردن لە نیش.
(٤) لادان و جێگرتنەوە: *( A ship ~s a certain amount of water.)*.

-displaceable *(adj.)*; displacer *(n.)*.

**displaced person,** کەسێکی سەرگەردان کراو یا دەربەدەربوو لە وڵاتی خۆی بەهۆی جەنگەوە.

**displacement** (dis-plās′mənt), *n.* (١) (ا) لە جێی خۆ لادان؛ لابردن. (ب) لاچوون لە جێی خۆ. (٢) دەرکردن لە کار؛ لادان لە نیش.
(٣) لادانی ئاو یا هەوا بە لەشێکی سەرئاوکەوتوو یا بە هەواوە.
(٤) جووڵانی زەوی (زەمینناسی) (٥) جێگرتنەوە.
(٦) گواستنەوەی هەستێک و ئاراستەکردنی بۆ شتێکی نابەجێ (پزیشکەوانی- دەروون).

**display** (dis-plā′), *v.t.* (١) کردنەوە؛ ڕاخستن.
(٢) نواندن (شتومەک، زیرەکی، هێز، ئازایی، ڕەووشت... هتد)
(٣) پیشاندان؛ دەرخستن؛ خستنەڕوو.
(٤) خستنەبەرچاو بە چاپی گەورە و جوان بۆ سەرنج ڕاکێشان.

*n.* (١) پیشاندان؛ خستنەبەرچاو؛ خستنەڕوو.
(٢) نواندن: *( a ~ of courage)*.
(٣) خۆنواندن؛ خۆدەرخستن. (٤) پیشانگە
(٥) چاپی جۆرجۆر بۆ سەرنج ڕاکێشان.

**displease** (dis-plēz′), *v.t. & v.i.* پەستکردن؛ توورەکردن؛ ڕق هەڵساندن؛ دڵ شکاندن؛ پێ ناخۆش بوون؛ پەست بوون؛ نابەدڵی کردن

**displeasure** (dis-plezh′ẽr), *n.* (١) پەستی؛ توورەیی؛ دڵ شکان؛ نابەدڵی؛ دڵ ئێشان. (٢) [Archaic]، نائاسوودەیی؛ ناخۆشی
(٣) [Archaic]، ئازار؛ ئازاردان.

**disposable** (dis-pō′zə-b'l), *adj.* (١) لەناودەبرێت یا فڕێ دەدرێت پاش یەک جار بەکارهێنان *( ~ bottles)*.
(٢) لەبەردەستدایە بۆ بەکارهێنان هەرکاتێک ویسترا بەپێی هەوەس

*n.* شتێک کە یەک جار بەکاردەهێنرێت و پاشان فڕێ دەدرێت.

**disposal** (dis-pō′z'l), *n.* (١) ڕێکخستن؛ دانان؛ جۆری دانان:
*( The ~ of the furniture in this room suits me.)*
(٢) بڕینەوە (کاروبار)؛ بەلایەکدا خستن.
(٣) پێدان؛ پێ بەخشین (٤) فڕێدان؛ لەناوبردن.
(٥) شت بەدەست بوون؛ دەسەڵاتی کردن. (٦) بەڕێوەبردن.

**at one's disposal,** لەبەردەستدابوون؛ لەژێردەستدابوون:
***(I am at your disposal.; My car is at your disposal.; He has at his disposal a great deal of money.)***

**dispose** (dis-pōz′), ***v.t.*** (١) ڕێکخستن؛ ڕێك وپێك کردن؛ دانان.
(٢) بڕینەوە (کاروبار)؛ خستن بەلایەکدا.
(٣) بەکارهێنان؛ نیش پێکردن.
(٤) ڕازی کردن؛ وامستکردن: ***(I'm ~d to agree with you.)***
(٥) وەهالێکردن: ***(The climate ~s the people to laziness.)***
***v.i.*** بڕیاردان؛ بڕینەوە؛ دەسەلاتی کردن بوون:
***(Man proposes, God ~s.)***

**dispose of,** (١) بڕینەوە (کاروبار)؛ بەلایەکدا خستن؛ چارەسەرکردن:
***(to dispose of business first)***
(٢) پێ بەخشین؛ پێدان.
(٣) فرۆشتن
(٤) لەناوبردن؛ خۆ لێ ڕزگارکردن؛ کوشتن؛ سەرکردن بە گۆمدا؛ خۆ لێ شاردنەوە ***(to dispose of a person or a thing)***.
(٥) تەواوکردن (خواردن، خواردنەوە)؛ هیچ نەهێشتن؛ قوتارکردن.

**disposed** (dis-pōzd′), ***adj.*** مەیل بوون بەرامبەر یا دژ بە:
***(He feels well- ~ or ill- ~ toward you.)***

**disposition** (dis′pə-zish′ən), ***n.*** (١) ڕێکخستن؛ ڕێك وپێك کردن؛ دانان (٢) بەڕێوەبردن؛ بڕینەوە (کاروبار).
(٣) (of ~)، بەخشین؛ پێدان
(٤) دەسەلاتی دابینکردن و بەڕێوەبردن؛ خاوەن بوون:
***(God has the supreme ~ of all things.)***
(٥) مەیل؛ نارەزوو؛ حەز: ***(a ~ to quarrel)***
(٦) سرووشتی کەسی: ***(a cruel, kind, generous, selfish, etc. ~ )***.

**dispossess** (dis′pə-zes′), ***v.t.*** لێ سەندنەوە (زەوی وزار، خانوو، سەرمایە)؛ بێبەش کردن؛ دەرکردن.
**-dispossessed *(adj.)*;** dispossession ***(n.)***; **dispossessor *(n.)*.**

**dispraise** (dis-prāz′), ***v.t.*** سەرزەنشت کردن؛ خراپە ووتن؛ بەدگۆیی کردن دەربارەی؛ پەسەندنەکردن؛ سووك کردن.
***n.*** سەرزەنشتی؛ سەرزەنشت؛ بەدگۆیی دەربارەی؛ سووکی؛ ووتەی ناشرین.

**disproof** (dis-prōōf′), ***n.*** (١) بەدرۆخستنەوە
(٢) بەڵگەی بەدرۆخستنەوە؛ بەڵگەی بەدرۆخەرەوە.

**disproportion** (dis′prə-pôr′shən, dis′prə-por′shən), ***n.*** ناهاوتایی؛ لارسەنگی؛ نەگونجان؛ ناهاوڕێژەیی؛ ڕێژەجیاوازی؛ لەڕادەبەدەری.
***v.t.*** ناهاوتاکردن؛ لارسەنگ کردن؛ ناهاوڕێژەکردن

**disproportional** (dis′prə-pôr′shən-'l, dis′prə-por′-shən-'l), ***adj.*** = **disproportionate.**
**-disproportionally *(adv.)*.**

**disproportionate** (dis′prə-pôr′shən-it, dis′prə-por′-shən-it), ***n.*** ناهاوڕێژە؛ لارسەنگ؛ ناهاوتا؛ لەڕادەبەدەر
***(Some boys give a ~ amout of their time to sports.)***
**-disproportionately *(adv.)*.**

**disprove** (dis-prōōv′), ***v.t.*** بەدرۆخستنەوە

**disputable** (dis-pū′tə-b'l, dis′pyoo-tə-b'l), ***adj.*** گومانی - تێدایە؛ نەبڕاوەتەوە؛ هێشتا بەلایەکدا نەخراوە (ناکۆکی).
**-disputability *(n.)*; disputably *(adv.)*.**

**disputant** (dis′pyoo-tənt, dis-pū′t'nt), ***adj.*** مشتومڕی؛ خەریکی مشتومڕکردن
***n.*** کەسێکی مشتومڕکەر

**disputation** (dis′pyoo-tā′shən), ***n.*** (١) ناکۆکی؛ دووبەرەکی
(٢) مشتومڕ؛ کێش مەکێش. (٣) [Obs.]، گفتوگۆ؛ ووتووێژ.

**disputatious** (dis-pyoo-tā′shəs), ***adj.*** حەز لە مشتومڕکەر؛ حەز لە ناکۆکی و کێش مەکێش کەر

**dispute** (dis-pūt′), ***v.i.*** (١) مشتومڕکردن؛ کێش مەکێش کردن.
(٢) دەمەقاڵێ بوون؛ شەڕکردن.
***v.t.*** (١) مشتومڕکردن لەسەر باسێك؛ لێکۆڵینەوە.
(٢) گومان لێکردن: ***(to ~ the truth of a statement)***.
(٣) بەرهەڵستی کردن؛ دژوەستان.
(٤) کۆشش بۆ کردن؛ هەوڵ بۆ دان؛ خەبات بۆ کردن.
***n.*** (١) مشتومڕ؛ کێش مەکێش؛ لێکۆڵینەوە.
(٢) ناکۆکی؛ دووبەرەکی؛ دەمەقاڵێ.
(٣) [Obs.]، شەڕ.

**beyond dispute,** بێ گومان؛ چەندوچوونی لەسەر نییە؛ ناکۆکی لەسەر نییە:
***(This is beyond dispute the best book on the subject.)***

**in dispute,** نەبڕاوەتەوە؛ نەخراوە بەلایەکدا؛ هێشتا ناکۆکی لەسەرە:
***(The matter in dispute is the possession of a house.; The outcome is in dispute.)***

**disqualify** (dis-kwôl′ə-fī), ***v.t.*** (١) بە لێنەهاتوو دانان.
(٢) ماف یا دەسەلات لێ سەندنەوە.
(٣) ڕێ پێ نەدان بۆ بەشداربوون لە پێشبڕکێ یا ملەملانێیەکدا لەبەر سەرپێچی
**-disqualification *(n.)*.**

**disquiet** (dis-kwī′ət), ***v.t.*** بێ سرەوت کردن؛ بێ ئاسوودە کردن؛ ئارام لێ هەڵگرتن؛ تێکدان؛ مەراق پێدان.
***n.*** بێ ئارامی؛ بێ سرەوتی؛ بێ ئاسوودەیی؛ مەراق.

**disquietude** (dis-kwī′ə-tōōd′, dis′kwī′ə-tūd′), ***n.*** مەراق؛ بێ ئارامی؛ سرەوت نەگرتن؛ بێ ئاسوودەیی

**disregard** (dis′ri-gärd′), ***v.t.*** (١) گوێ پێ نەدان؛ فەرامۆش کردن؛ خستنەلاوە. (٢) بایەخ پێ نەدان؛ بە سووك گرتن یا دانان؛ ڕێزنەگرتن
***n.*** (١) گوێ پێ نەدان؛ فەرامۆش کردن؛ فەرامۆشی؛ خستنەلاوە.
(٢) بایەخ پێ نەدان؛ بە سووك گرتن؛ ڕێز نەگرتن؛ گاڵتە پێ هاتن:
***(Criminals have a total ~ for human values.)***
**-disregardful *(adj.)*.**

**disremember** (dis′ri-mem′bēr), ***v.t.*** لەیادچوون؛ لەیادنەبوون؛ لەبیرنەمان.

**disrepair** (dis′ri-pâr′), ***n.*** پەرپووتی (خانوو، باری ژیان)؛ فەرامۆشی: ***(The building is in ~.)***.

**disreputable** (dis-rep′yoo-tə-b'l), ***adj.*** ناوبانگ خراپ؛ بەدناو؛ سووك: ***(a ~ person)***
**-disreputably *(adv.)*.**

**disrepute** (dis′ri-pūt′), ***n.*** بەدناوی؛ ناوبانگ خراپی؛ ناوزڕاوی؛ سووك.

**disrespect** (dis′ri-spekt′), ***n.*** ڕێزنەگرتن؛ بێ ڕێزی؛ ڕێز بۆ نەبوون.
***v.t.*** ڕێزنەگرتن؛ ڕێز بۆ نەبوون

**disrespectable** (dis′ri-spek′tə-b'l), ***adj.*** شایستەی ڕێز نییە؛ بێ ڕێز.

**disrespectful** (dis′ri-spekt′fəl), ***adj.*** ڕێز پیشان نەدەر؛ بێ ئەزاکەت: ***(One should not be ~ toward his parents.)***

**disrobe** (dis-rōb′), ***v.t. & v.i.*** ڕووتکردنەوە؛ خۆڕووتکردنەوە؛ جل داکەندن.

**disrupt** (dis-rupt′), ***v.t.*** (١) پێ بڕین (گفتوگۆ، کار)؛ بڕین:
***(Don't ~ people when they are talking.)***
(٢) پچڕاندن؛ لەیەککردنەوە؛ پارچە پارچە کردن.
(٣) شێواندن؛ تێکدان: ***(to ~ someone's life)***.
***adj.*** پچڕاو؛ شێواو؛ تێکچوو.

**disruption** (dis-rup′shən), ***n.*** (١) پێ بڕین (گفتوگۆ، کار)؛ بڕین؛ پچڕان. (٢) شێواندن؛ شێواوی؛ تێکدان؛ تێکچوون.
(٣) بەش بەش بوون؛ پارچە پارچە بوون.

**disruptive** (dis-rup′tiv), *adj.* (١) پیبڕ (گفتوگۆ، کار)
*( A child can be very ~ to one's work.)*
(٢) شێوێنەر؛ تێکدەر: *( a ~ event)* .
**dissatisfaction** (dis′sat-is-fak′shən), *n.* ناڕەزایی؛ نابەدڵی؛
نایەسەندی *( The teacher expressed ~ at his pupils' work.)* .
-**dissatisfactory** *(adj.)*.
**dissatisfied** (dis-sat′is-fīd′), *adj.* ناڕازی؛ بەدڵ نەبوو؛ بێزار.
**dissatisfy** (dis-sat′is-fī′), *v.t.* ڕازی نەکردن؛ دڵ شکاندن؛
نابەدڵی کردن
**dissect** (di-sekt′), *v.t.* (١) بەکاڵاکردنەوە (لاشە)؛ توێکاری کردن.
(٢) شیکردنەوە؛ لێکۆڵینەوە زۆر بە وردی. *( to ~ a problem)* .
**dissected** (di-sek′tid), *adj.* بەش بەش (ڕووەکناسی):
*( ~ leaves)*
**dissection** (di-sek′shən), *n.* (١) توێکاری؛ توێکاری کردن؛
بەکاڵاکردنەوە (٢) شتێکی توێکاری کراو (لاشە، شانە).
(٣) شیکردنەوە؛ بە وردی لێکۆڵینەوە.
**dissemble** (di-sem′b'l), *v.t.* (١) شاردنەوە (بۆ ساختەو فێڵبازی).
(٢) وانوواندن؛ لاسایی کردنەوە: *( Vice sometimes ~s virtue.)* .
(٣) چاو لێ پۆشین؛ خۆ لێ کەڕکردن
*v.i.* دووڕوویی کردن؛ دووزمانی کردن؛ بە درۆ هەست نیشاندان.
-**dissemblance** *(n.)*.
**disseminate** (di-sem′ə-nāt′), *n.* بە هەموولایەکدا بڵاوکردنەوە؛
تۆودان: *( to ~ information about something)* .
-**dissemination** *(n.)*; **disseminator** *(n.)*.
**dissension** (di-sen′shən), *n.* جیاوازی بیروڕا (لە ڕێکخراو، کۆمەڵ،
حیزب، سوپا، یا وڵاتێکدا)؛ ناکۆکی؛ دووبەرەکی؛ ڕێک نەکەوتن؛ دابڕان.
**dissent** (di-sent′), *v.i.* (١) ڕا جیابوون؛ لادان؛ لەگەڵ ڕێک نەکەوتن؛
ناکۆک بوون *( One judge ~ed from the others.)* .
(٢) دژ وەستان؛ پاڵپشتی نەکردن؛ دووبەرەکی کردن.
*n.* (١) جیاوازی بیروڕا؛ ناکۆکی؛ دووبەرەکی.
(٢) بەگوێ نەکردن؛ دژ وەستان؛ لەگەڵ نەبوون؛ بەرهەڵستی کردن.
**dissenter** (di-sen′tēr), *n.* (١) دژوەستاو؛ بەگوێ نەکەر؛ ناکۆک؛
پاڵپشتی نەکەر؛ دەنگ بۆ نەدەر.
(٢) [D-]. پرۆتستانتێک کە دژی ڕێبازی کڵێسەی ئینگلیزی بێت.
**dissertate** (dis′ēr-tāt′), *v.i.* [Rare]. لێدوان؛ لێکۆڵینەوە؛
باسکردن
-**dissertator** *(n.)*.
**dissertation** (dis′ēr-tā′shən), *n.* نامەی دکتۆرا؛ دوکتۆرانامە؛
وتار، باس، یا لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ
**disserve** (dis-sũrv′), *v.t.* زیان لێدان؛ زیان پێ گەیاندن.
**disservice** (dis-sũr′vis), *n.* زیان؛ زیانبەخش (کردەوە، وتە).
*( His action is a ~ to the nation.)*
**dissever** (di-sev′ēr), *v.t.* (١) پچڕاندن؛ لێکردنەوە؛ بڕین
(٢) بەش بەش کردن؛ دابەشکردن
*v.i.* پچڕان؛ لەیەکبوونەوە؛ جیابوونەوە
**dissidence** (dis′ə-dəns), *n.* جیاوازی بیروڕا؛ ناکۆکی؛ دووبەرەکێتی؛
ڕێک نەکەوتن؛ دابڕان
**dissident** (dis′ə-dənt), *adj.* ناکۆک؛ خۆجیاکەرەوە؛ جیابووەوە؛
دابڕاو؛ هەڵگەڕاوە *( a ~ group within the party)* .
*n.* کەسێکی ناکۆک، دابڕاو، هەڵگەڕاوە، نەگونجاو، یا بیروڕا جیاواز (لە کۆمەڵ،
ڕێکخراو، حیزب، سوپا... هتد).
**dissimilar** (di-sim′ə-lēr, dis-sim′ə-lēr), *adj.* جیاواز؛
لەیەک نەچوو
**dissimilarity** (di-sim′ə-lar′ə-ti, dis-sim′ə-lar′ə-ti), *n.*
جیاوازی؛ لەیەک نەچوون؛ ناچوونیەکی

**dissimilate** (di-sim′ə-lāt′, dis-sim′ə-lāt′), *v.t.* گۆڕین؛
جیاوازی کردن.
*v.i.* (١) جیاوازبوون؛ گۆڕان. (٢) گۆڕانی تیپێك بۆ تیپێکی جیاواز (زمانەوانی).
**dissimilation** (di-sim′ə-lā′shən, dis′sim′ə-lā′shən), *n.*
(١) جیاوازی کردن؛ گۆڕین؛ گۆڕان.
(٢) گۆڕانی تیپێك بۆ تیپێکی جیاواز (زمانەوانی).
(وەك وشەی **marble** لە وشەی **marbre** ی فەرەنسییەوە).
**dissimilitude** (dis′si-mil′ə-tōōd′, dis′si-mil′ə-tūd′), *n.*
(١) جیاوازی؛ لەیەك نەچوون.
(٢) شتێکی جیاوازیکەر؛ خاڵێکی جیاکەرەوە.
**dissimulate** (di-sim′yoo-lāt′), *v.i. & v.t.* دووزمانی کردن؛
دووڕوویی کردن؛ هەستی درۆ پیشاندان.
-**dissimulation** *(n.)*; **dissimulator** *(n.)*.
**dissipate** (dis′ə-pāt′), *v.t.* (١) بڵاوکردنەوە؛ پەرش‌وبڵاوکردنەوە؛
تۆودان.
(٢) نەهێشتن؛ ڕەواندنەوە؛ لابردن: *( to ~ fear, doubts, mist, etc.)*
(٣) بەفیڕۆدان؛ لەناوبردن: *( to ~ one's energy or fortune)*
*v.i.* کات‌و وزەی خۆ بەفیڕۆدان بە ڕابواردن‌و خواردنەوەو قومارکردنەوە؛
سەرسەرێتی کردن.
-**dissipater**; **dissipator** *(n.)*; **dissipative** *(adj.)*.
**dissipated** (dis′ə-pāt′id), *adj.* (١) بڵاو؛ پەرش‌وبڵاو؛ تۆودراو.
(٢) بەفیڕۆدراو؛ لەناوبراو. (٣) سەرسەری؛ بەرەڵا.
**dissipation** (dis′ə-pā′shən), *n.* (١) پەرش‌وبڵاوبوونەوە یا
کردنەوە. (٢) نەمان؛ لابردن؛ نەهێشتن.
(٣) کات، وزە، یا سامان بەفیڕۆدان؛ لەناوبردن.
(٤) سەرسەرێتی؛ لە ئەندازە بەدەر ڕابواردن.
**dissociate** (di-sō′shi-āt′), *v.t.* (١) لەیەك جیاکردنەوە؛
پەیوەندی پچڕاندن؛ لەیەکتر بڕین. (٢) بە جیا دانان.
(٣) جیاکردنەوە (کیمیاگەری).
*v.i.* (١) خۆ جیاکردنەوە؛ لێ جیابوونەوە؛ پەیوەندی پێوە نەمان.
(٢) جیابوونەوە (کیمیاگەری).
**dissociate oneself from,** خۆ لێ جیاکردنەوە، کشانەوە یا تەکاندنەوە؛
حاشالێکردن.
-**dissociative** *(adj.)*.
**dissociation** (di-sō′si-ā′shən, di-sō′shi-ā′shən), *n.* (١)
جیاکردنەوە؛ جیابوونەوە؛ پەیوەندی بڕین یا بڕان
(٢) جیابوونەوە، توانەوە، یا پارچە پارچە بوونی ئاوێتەیەك (کیمیاگەری)
(٣) دوو کەسایەتی (پزیشکەوانی دەروونی)؛ جووت سرووشتی؛
شیزۆفرینیا
**dissoluble** (di-sol′yoo-b'l), *adj.* دەتوێتەوە؛ دەتوێنرێتەوە.
-**dissolubility** *(n.)*.
**dissolute** (dis′ə-lōōt′, dis′ə-lūt′), *adj.* سەرسەری؛
بەرەڵا (ڕەووشت)
**dissolution** (dis′ə-lōō′shən, dis′ə-lū′shən), *n.* (١) توانەوە؛
تواندنەوە. (٢) پارچە پارچە بوون؛ شیبوونەوە؛ هەڵوەشانەوە؛ هەڵوەشاندنەوە
(٣) دوایی هاتن؛ دوایی پێ هێنان.
(٤) (ا) دوایی پێ هێنان (پەرلەمان)؛ ئاشبەتاڵ لێکردن.
(ب) دوایی پێ هێنان یا تواندنەوە (کۆمپانیا، بازرگانی).
(٥) مردن؛ نەمان.
(٦) هەڵوەشاندنەوە (پەیمان، ژن‌ومێردایەتی).
**dissolve** (di-zolv′), *v.t. & v.i.* (١) تواندنەوە؛ توانەوە.
(٢) پارچە پارچە کردن؛ لەیەك جیاکردنەوە؛ هەڵوەشانەوە؛ هەڵوەشاندن.
(٣) دوایی پێ هێنان؛ ئاشبەتاڵ لێکردن: *( to ~ the parliament)* .
(٤) لە چاو ون بوون؛ نەمان.
*n.* وردە وردە دەرکەوتن یا ون بوونی دیمەنێك لە فیلم یا تەلەفزیۆندا

**-dissolvable** *(adj.)*.

**dissolvent** (di-zol′vənt), *adj.* تویـنـەرەوە

*n.* ماددەیەکی توێنەرەوە.

**dissonance** (dis′ə-nəns), *n.* (١) لەگەڵ یەك نەگونجان (ئاوان)؛ گەرەلاوژێ. (٢) نەگونجان؛ ناکۆکی؛ ڕێك نەکەوتن.

**dissonant** (dis′ə-nənt), *adj.* (١) نەگونجاو (ئاوان)؛ نەساز (دەنگ). (٢) ناکۆك؛ جیاواز؛ نەگونجاو؛ ڕێك نەکەوتوو.

**dissuade** (di-swād′), *v.t.* پەشیمان کردنەوە؛ ساردکردنەوە.
*( They ~d him from going.)*

**-dissuader** *(n.)*.

**dissuasion** (di-swā′zhən), *n.* پەشیمان کردنەوە؛ ساردکردنەوە.

**-dissuasive** *(adj.)*; **dissuasively** *(adv.)*; **dissuasiveness** *(n.)*.

**dissyllable** (di-sil′ə-b'l, dis′sil′ə-b'l), *n.* *Also* **disyllable**. وشەیەکی دووبڕگەیی (وەك: **succeed, receive, debate**).

**-dissyllabic** *(adj.)*.

**dissymmetry** (dis-sim′ə-tri), *n.* نارێکی؛ وەك یەك نەبوون؛ ناهاورێژەیی؛ نەگونجان؛ لارسەنگی

**-dissymmetric** *(adj.)*; **dissymetrical** *(adj.)*; **dissymetrically** *(adv.)*.

**distaff** (dis′taf, dis′täf), *n.* (١) تەشی (٢) کاروباری ژنانە؛ کاری ناومال (٣) ژنان؛ ژن.

**distaff side,** خزمی دایکی

**distance** (dis′təns), *n.* (١) دووری؛ ماوە (ڕێگە، شوێن).
(٢) ماوە (کات)؛ دووری (کات)
(٣) جیاوازی؛ دووری: *( the ~ between health and illness)*.
(٤) ساردی (لەگەڵ جوولانەوە)؛ دوورەپەرێزی
(٥) شوێنێکی دوور؛ دوور *( The bird flew away into the ~ .)*.
(٦) کاتێکی دوور؛ دوور:
*( At this ~ we cannot know the Neanderthal man.)*

*v.t.* (١) دوورگرتن؛ دوورخستنەوە؛ دوور ڕاگرتن
(٢) بردنەوە؛ پێشکەوتن (ملەملێ)؛ بەزاندن

**keep (someone) at a distance,** بە ساردی لەگەڵدا جوولانەوە؛ ڕوو پێ نەدان.

**keep one's distance,** خۆ دوور گرتن؛ خۆ تەریك گرتن

**distant** (dis′tənt), *adj.* (١) دوور (شوێن، کات)
(٢) دوور (خزم): *( ~ relatives)*
(٣) سارد (هەڵسان و دانیشتن)؛ دوورەپەرێز
(٤) لە دوورەوە؛ دوور: *( a ~ sound)*

**distaste** (dis-tāst′), *n.* نەویستن؛ بەدڵ نەبوون؛ حەز لێ نەکردن؛ بێزلێبوون؛ بێز: *( to have a ~ for something)*.

*v.t.* (١) حەز لێ نەکردن؛ بەدڵ نەبوون؛ نەویستن؛ بێز لێ بوون.
(٢) پەستکردن؛ نابەدڵی کردن؛ دڵ شکاندن

**distasteful** (dis-tāst′fəl), *adj.* ناشرین (کردەوە، ڕەفتار)؛ ناپەسەند؛ پیس؛ ناخۆش

**distemper** (dis-tem′pẽr), *v.t.* (١) تێکدان؛ شێواندن.
(٢) نەخۆش خستن؛ تێکدان (تەندرووستی).

*n.* (١) نەخۆشی؛ تێکچوون (مێشك، لەش).
(٢) (ا) نەخۆشی سەگ. (ب) نەخۆشی ئەسپ.
(٣) تەنگەجیکلانەیی؛ تووڕەوتڕۆیی (٤) پشێوی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی.

**distemper** (dis-tem′pẽr), *v.t.* (١) تێکەڵ کردن (ڕەنگ)
(٢) وێنەکێشان بەم ڕەنگە تێکەڵە.

*n.* (١) وێنەکێشان بە ڕەنگی تێکەڵ کراو.
(٢) وێنەیەك کە بەم جۆرە ڕەنگە تێکەڵ کراوە کرابێت.

**distemperature** (dis-tem′prə-chẽr, dis-tem-pẽr-ə-chẽr), *n.* نەخۆشی (مێشك، لەش)

**distend** (di-stend′), *v.t. & v.i.* (١) کشاندن؛ کشان
(٢) ئاوسان؛ فووتێکردن

**-distension; distention** *(n.)*.

**distill, distil** (di-stil′), *v.t.* (١) بە دڵۆپ دڵۆپ هێنانەخوارەوە؛ دڵۆپاندن. (٢) ووشین؛ گوشین. (٣) پاڵاوتن؛ پاکردنەوە؛ پوختەکردن.
(٤) جیاکردنەوە (بیروباوەڕ).

*v.i.* (١) دڵۆپ دڵۆپ هاتنەخوارەوە. (٢) ووشین؛ پاڵاوتن؛ پاکبوونەوە.

**distillate** (dis′t'l-it, dis′t'l-āt′), *n.* شلەی پاڵاوتە یا پوختە؛ شلەی دڵۆپێنراو.

**distillation** (dis′t'l-ā′shən), *n.* (١) پاڵاوتن؛ پوختەکردن.
(٢) شلەیەك یا شتێکی پاڵاوتەکراو.
(٣) پوختە یا پاڵاوتەی شتێك؛ ناوکرۆك؛ ماك.

**distilled** (di-stild′), *adj.* پاڵاوتەکراو؛ پاڵاوتە؛ پوخت: *( ~ water)*.

**distiller** (di-stil′ẽr), *n.* (١) پوختەکەر (مرۆڤ، ئامێر)؛ پاڵێوەر.
(٢) خواردنەوەی سەرخۆشکەر دروستکەر (مرۆڤ، کۆمپانیا)

**distillery** (di-stil′ẽr-i), *n.* (١) پاڵێوگە.
(٢) کارگەی خواردنەوەی سەرخۆشکەر.

**distinct** (di-stiŋkt′), *adj.* (١) جیا؛ جیاواز؛ تایبەتی.
(٢) دیار؛ ڕوون؛ ئاشکرا.

**distinction** (di-stiŋk′shən), *n.* (١) جیاوازی؛ جیاوازی کردن:
*( Making ~s between all the meanings of a word is very important.)*
(٢) نیشانەی جیاوازی یا جیاکەرەوە؛ نیشانەی تایبەتیکەر؛ دیاریکەر.
(٣) نایابی؛ لێهاتوویی؛ زۆرباشی؛ بەرزی: *( a writer of ~ )*.
(٤) خەڵات؛ پاداشت: *( The soldier won many ~s for bravery.)*.

**distinctive** (di-stiŋk′tiv), *adj.* جیا؛ جیاکەرەوە؛ دیار
*( a ~ voice, smile, or walk)*

**distinctly** (di-stiŋkt′li), *adv.* بەڕوونی؛ بەڕێكوپەوانی؛ بێ گومان.

**distinguish** (di-stiŋ′gwish), *v.t.* (١) جیاکردنەوە؛ جیاوازی بینین.
(٢) تایبەتی کردن؛ نیشانەکردن.
(٣) بینین؛ ناسینەوە؛ هەستپێکردن.
(٤) پۆل پۆل کردن؛ هاوپۆل کردن؛ جۆرجۆرکردن.
(٥) ناوبانگ دەرکردن؛ ناودەرکردن: *( He ~ed himself as a writer.)*.

*v.i.* لەیەك جیاکردنەوە.

**-distinguishable** *(adj.)*.

**distinguished** (di-stiŋ′gwisht), *adj.* (١) بەناوبانگ؛ ناسراو؛ هەڵکەوتوو؛ بەڕێز: *( a ~ man or woman)*.
(٢) نایاب؛ زۆرباش.

**distort** (di-stôrt′), *v.t.* (١) شێوە تێکدان؛ تێکدان:
*( His face was ~ed by rage.)*
(٢) گۆڕین؛ هەڵگێڕانەوە؛ شێواندن؛ تێکدان: *( You ~ the facts.)*

**distortion** (di-stôr′shən), *n.* (١) شێوە تێکدان؛ تێکدان؛ گۆڕین.
(٢) شێوە تێکچوون؛ تێکچوون؛ گۆڕان.
(٣) شتێکی شێوە تێکدراو، گۆڕاو یا شێوێنراو.

**distract** (di-strakt′), *v.t.* (١) خلافاندن؛ سەرنج ڕاکێشان؛ مێشك مەشغوڵ کردن. (٢) سەرشێت کردن؛ سەر لێ تێکدان؛ شێت کردن.

**distraction** (di-strak′shən), *n.* (١) خلافاندن؛ خەریك کردن؛ مەشغولی مێشك؛ سەرنج ڕاکێشان.
(٢) شتی خۆشی و ڕابواردن؛ شتێك کە کاتی پێ ببرێتە سەر:
*( There are plenty of ~s in a big city.)*
(٣) شتێك کە لە ناوەختدا سەرنج ڕادەکێشێت و دەبێتە هۆی پەستکردن:
*( Noise is a ~ when you're trying to study.)*
(٤) شێتی؛ شێتگیریی؛ سەر لێ تێکچوون.

**distracted** (di-strak′tid), *adj.* دالغە یا خەیاڵی لە شوێنێکی ترە.

**distrain** (di-strān′), *v.t. & v.i.* دەست بەسەردا گرتنی سەرمایەی

قەرزارێك وەك بارمتە.
**-distrainment** *(n.)*; **distrainor, distrainer** *(n.)*.
**distrainee** (dis´trā-nē′), ***n.*** قەرزارێك کە دەست بەسەر سەرمایەکەیدا دەگیرێت وەك بارمتە.
**distraught** (di-strôt′), ***adj.*** (١) پەشۆکاو؛ سەر لێ شێواو؛ پەرێشان؛ سەر لێ تێکچوو. (٢) شێت؛ شێت و شەیدا.
**distress** (di-stres′), ***v.t.*** (١) دڵتەنگ کردن؛ غەمبارکردن؛ ئازاردان؛ پەرێشان کردن؛ سوێ کردن بە دڵدا.
(٢) دەست بەسەردا گرتنی سەرمایەی قەرزارێك وەك بارمتە.
***n.*** (١) دڵتەنگی؛ غەمباری؛ ئازار؛ سوێ؛ ناخۆشی؛ ئەشکەنجە.
(٢) هەژاری؛ داماوی.
(٣) لێقەومان؛ تەنگانە؛ پەرێشانی: ***( a ship in ~ )*** .
(٤) (ا) دەست بەسەرداگرتنی سەرمایەی قەرزارێك وەك بارمتە.
(ب) سەرمایەی دەست بەسەردا گیراو.
**distressed** (di-strest′), ***adj.*** دڵتەنگ؛ غەمبار؛ پەرێشان؛ هەژار؛ لێقەوماو؛ جەرگ سووتاو.
**distressful** (di-stres′fəl), ***adj.*** (١) ناخۆش؛ بەناسۆر؛ بەسوێ؛ بەئازار (٢) سوێدار؛ دڵپڕ؛ غەمبار.
**distributary** (di-strib′yoo-ter´i), ***n.*** زێیەك کە لە ڕووبارێك جیادەبێتەوەو هەرگیز ناڕژێتەوە ناو ڕووبارەکە (بەتایبەتی لە تەختاییدا).
**distribute** (di-strib′yoot), ***v.t.*** (١) دابەشکردن؛ بەخشینەوە؛ بەشکردن ***( to ~ food to the poor)*** .
(٢) بڵاوکردنەوە: ***( to ~ a leaflet)*** .
(٣) هاوپۆل کردن؛ جۆرجۆرکردن.
(٤) [Archaic]، دادگەری کردن.
**distribution** (dis´trə-bū′shən), ***n.*** (١) دابەشکردن؛ دابەش بوون؛ بەشکردن: ***( The ~ of wealth is very uneven.)***
(٢) جۆری دابەشکردن: ***( an equal ~ of property)*** .
(٣) بەش (٤) فرۆشتن یا ساغ کردنەوەی شتومەك لە بازاڕدا.
**distributive** (di-strib′yoo-tiv), ***adj.*** (١) بەشکەر
(٢) تایبەتی بە بەشکردن.
(٣) تایبەتی بە هەموو یەکێك لە کۆمەڵە شتێك (زمانەوانی):
**( "Each", "every", "any", "either", and "neither" are called ~ pronouns.)**
***n.*** وشەیەکی وەها (ژمارە سێ ببینە).
**distributor** (di-strib′yoo-tēr), ***n.*** (١) بەشکەر (مرۆڤ، ئامێر، شت)؛ دابەشکەر. (٢) نوێنەری دابەشکردن یا ساغ کردنەوەی کاڵا بەسەر کڕیاردا (بەتایبەتی کۆفرۆش). (٣) ئامێری دابەشکەری تەزووی کارەبا (مەکینەی ئوتومبیل).
**district** (dis′trikt), ***n.*** ناوچە؛ هەرێم؛ گەڕەك؛ ناوچەی وڵات یا شارێك: ***( a school ~ ; the business ~ ; a residential ~ ; an electoral ~ )***
**district attorney,** پارێزەری دادگەری گشتی ناوچە.
**distrust** (dis-trust′), ***v.t.*** بڕوا پێ نەکردن؛ بڕوا پێ نەبوون؛ گومان لێ بوون؛ دڵ لێ پیس بوون؛ دڵ لێ پیس کردن.
**distrustful** (dis-trust′fəl), ***adj.*** دڵ پیس؛ بەگومان؛ بڕوانەکەر؛ بێ بڕوا
**distrustful of,** دڵ پیس؛ دڵی لێ پیسە؛ بڕوای پێی نییە.
**disturb** (di-stûrb′), ***v.t.*** (١) ئاژاوە نانەوە؛ ئاسوودەیی تێکدان؛ تێکدان؛ شڵەقاندن؛ شڵەژاندن. (٢) پەستکردن؛ دڵ گرتن؛ تووڕەکردن.
(٣) دەستکاری کردن؛ دەست تێوەدان؛ شێواندن: ***( Don't ~ my things.)*** .
(٤) پێ بڕین (گفتوگۆ، کار)
**disturb the peace,** ئاژاوە نانەوە؛ ئاشووب خستنەوە؛ ئاشتی تێکدان.
**disturbance** (di-stûr′bəns), ***n.*** (١) ئاسوودەیی تێکدان؛ شێواندن.
(٢) پەستکەر؛ دڵتەنگکەر؛ ئاسوودەیی تێکدەر.

(٣) بێ ئاسوودەیی؛ مەراق.
(٤) ئاژاوە؛ ئاشووب؛ هەراوهوریا؛ پشێوی.
**disunion** (dis-ūn′yən), ***n.*** (١) جیابوونەوە (ناوچەی وڵات، کۆمەڵ، مرۆڤ). (٢) ناکۆکی؛ جیاوازی؛ نەگونجان.
**disunionist** (dis-ūn′yən-ist), ***n.*** (١) جیابوونەوەخواز.
(٢) جیابوونەوەخوازێك لەکاتی شەڕی براکوژی لە ئەمەریکادا.
**disunite** (dis´yoo-nīt′), ***v.t.*** لەیەك جیابوونەوە؛ یەك پێ نەگرتن.
***v.i.*** جیابوونەوە (ناوچەی وڵات، کۆمەڵ)؛ یەك نەگرتن؛ بەش بەش بوون.
**disunity** (dis-ūn′ə-ti), ***n.*** ناکۆکی؛ جیابوونەوە؛ بەش بەش بوون؛ یەك نەگرتن؛ ڕێك نەکەوتن.
**disuse** (dis-ūz′), ***v.t.*** بەکارنەهێنان (لەبەر کۆنی، بێ کەڵکی، یا نەویستن).
***n.*** بەکارنەهێنان: ***( The word has fallen into ~ )*** .
**disvalue** (dis-val′ū), ***v.t.*** [Rare], بە بێ بایەخ دانان؛ بە هیچ دانان.
**disyllable** (di-sil′ə-b'l), ***n.*** = **dissyllable.**
**-disyllabic** *(adj.)*.
**ditch** (dich), ***n.*** خەنەق؛ چاڵ؛ کەندڕ؛ جۆگە.
***v.t.*** (١) خەنەق یا جۆگە بەدەوردا هەڵکەندن.
(٢) خەنەق یا جۆگە تێدا هەڵکەندن.
(٣) لە هێڵ لابردن و خستنە خەنەقەوە (شەمەندەفەر).
(٤) نیشتنەوەی فڕۆکەیەکی پەککەوتوو لەناو ئاوداو واز لێ هێنانی.
(٥) [Slang]، دەست پێوەنان؛ واز لێ هێنان (مرۆڤ)؛ خۆ لێ دزینەوە:
***( to ~ a friend or a date)***
***v.i.*** خەنەق یا جۆگە هەڵکەندن.
**dithyramb** (dith′ə-ram´, dith′ə-ramb´), ***n.*** گۆرانی یا وتارێکی پڕ سۆزو بەجۆش.
**ditto** (dit′ō), ***n.*** (١) دووبارە؛ هەروەها؛ هەمان شت؛ دیسانەوە.
(٢) وێنەی دەقاودەق. (٣) نیشانەی چوونیەکی ( 〃 ) .
***adv.*** دووبارە؛ دیسانەوە؛ هەروەها؛ هەمان چەشن.
***v.t.*** دووبارەکردنەوە؛ وێنەی دەقاودەق دەرکردن.
**ditto machine,** ڕۆنیۆ؛ مەکینەی ڕۆنیۆ؛ مەکینەی وێنەی دەقاودەق دەرکردن.
**ditto mark,** نیشانەی چوونیەکی ( 〃 ) .
**ditty** (dit′i), ***n.*** گۆرانییەکی سادەی کورت؛ بەستە.
**diuresis** (dī´yoo-rē′sis), ***n.*** زۆر میزکردن.
**-diuretic** *(adj. & n.)*.
**diurnal** (dī-ûr′n'l), ***adj.*** (١) ڕۆژانە؛ هەموو ڕۆژێك ڕوودەدات.
(٢) هی ڕۆژگار؛ هی ڕۆژ (نەك شەو)؛ بە ڕۆژ
(٣) تەنها یەك ڕۆژ دەژی (جانەوەرناسی)
(٤) بە ڕۆژ چالاکە (گیانەوەرناسی).
***n.*** [Archaic]. (١) بیرنامە. (٢) ڕۆژنامە.
**-diurnally** *(adv.)*.
**diva** (dē′və), ***n.*** = **prima donna.**
**divan** (di-van′), ***n.*** (١) دیوان؛ ئەنجومەنی شاهانە.
(٢) (ا) دیوەخان. (ب) ژووری جگەرەکێشان یا قاوە خواردنەوە.
(٣) قەنەفەی بێ پشت.
**dive** (dīv), ***v.i.*** (١) بازدانە ناو ئاوەوە بەسەردا؛ خۆهەڵدانە ناو ئاو.
(٢) لەپڕ خۆ نوقم کردن یا چوونە ژێر ئاوەوە: ***( A submarine ~s.)***
(٣) دەست تێخستن؛ خۆ تێخستن؛ خۆ خستنە ناو؛ چوونە ناو.
(٤) لەپڕ لە چاو وون بوون
(٥) (ا) لەپڕ نزم بوونەوە یا هاتنەخوارەوەی فڕۆکە:
***( The plane ~d [or dove] two thousand feet.)***
(ب) لەپڕ شاڵاوهێنان بۆ خوارەوەی باڵندەیەکی وەك هەڵۆ (بۆ نێچیر گرتن).
(ج) خۆ فڕێدان لە فڕۆکەوە بە پەڕەشووت.
***v.t.*** (١) لەپڕ تێخستن (دەست، سەر). (٢) لەپڕ فڕۆکە هێنانەخوارەوە.

***n.*** (١) خۆ فڕێدانە ناو ئاوەوە بەسەردا؛ بازددانە ناو ئاوەوە بەسەردا.
(٢) لەپڕ نزم بوونەوە یا هاتنەخوارەوەی فڕۆکە: ***( The plane took a ~ .)*** .
(٣) تێ فڕێدان؛ نوقوم بوون؛ ژێر ئاو کەوتن.
(٤) [Colloq.]. بارێکی پیسی ناوبانگ سووک.
**diver** (dīv′ēr), ***n.*** (١) بکەری **dive** .
(٢) مەلەوانی ژێرئاو؛ ژێرئاوگەڕ (بۆ مرواری و شتی تری بەنرخ یا بۆ گیانداری دەریایی . (٣) جۆرە باڵندەیەکی خۆفڕێدەرە ناو ئاوەوەیە (بۆ نێچیر گرتن).
**diverge** (də-vũrj′, dī-vũrj′), ***v.i.*** (١) جیابوونەوە (ڕێگە)؛ لق لێ بوونەوە؛ لەیەك جیابوونەوە: ***( The road ~s.)*** .
(٢) جیاوازبوون (ڕەووشت)؛ جیابوون. (٣) لادان (لە ڕێی ڕاست).
**divergence** (də-vũr′jəns, dī-vũr′jəns), ***n.*** (١) جیابوونەوە؛ لەیەك جیابوونەوە؛ لق لێ بوونەوە. (٢) لادان؛ جیابوون؛ جیاوازی.
**divergency** (də-vũr′jən-si, dī-vũr′jən-si), ***n.*** divergence.
**divergent** (də-vũr′jənt, dī-vũr′jənt), ***adj.*** (١) جیابووەوە؛ لێ جیابووەوە (٢) لادەر (لە ڕێی ڕاست).
(٣) جیا؛ جیاواز ***( a ~ opinion)***
(٤) لار (بیرکاری)؛ خوار (هێڵ).
**divers** (dī′vērz), ***adj.*** چەند؛ چەندەها؛ هەند؛ جیا.
**diverse** (də-vũrs′, dī-vũrs′, dī′vũrs), ***adj.*** (١) جیا؛ جیاواز
(٢) هەمەچەشن؛ جۆراوجۆر؛ جیاجیا: ***( a ~ culture)*** .
-diversely ***(adj.)***; **diverseness** ***(n.)***.
**diversified** (də-vũr′sə-fīd′, dī-vũr′sə-fīd′), ***adj.*** جیاجیا؛ هەمەچەشن؛ جۆراوجۆر: ***( a ~ country)*** .
**diversiform** (də-vũr′sə-fôrm′, dī-vũr′sə-fôrm′), ***adj.*** هەمەشێوە؛ هەمەجۆر
**diversify** (də-vũr′sə-fī′, dī-vũr′sə-fī′), ***v.t.*** (١) جۆرجۆرکردن؛ هەمەچەشن کردن؛ گۆڕین: ***( You need to ~ your diet.)*** .
(٢) خستنەکاری سەرمایە لە گەلێك کۆمپانیادا بۆ کەمکردنەوەی مەترسی لەکیس چوون ***( to ~ one's investment)*** .
***v.i.*** هەمەچەشن بوون؛ جۆرجۆربوون.
-diversification ***(n.)***.
**diversion** (də-vũr′zhən, dī-vũr′shən), ***n.*** (١) خستنەلاوە (بەتایبەتی پارە بۆ خۆ یا مەبەستی نابەجێ)؛ لێ لادان؛ لادان:
***( ~ of funds from the treasury)***
(٢) خڵافاندن؛ سەرنج ڕاکێشان بۆ هەڵخەڵەتاندن: ***( ~ of the enemy)*** .
(٣) خەریك کردن؛ کات کوشتن.
(٤) شتی کات پێ بردنە سەر؛ ڕابواردن؛ کات کوژ: ***( a harmless ~ )*** .
**diversionary** (də-vũr′zhən-er′i, dī-vũr′shən-er′i), ***adj.*** خڵافێنەر (بەتایبەتی دوژمن بۆ سوود وەرگرتن)؛ خەریك کردن یا خڵافاندن بۆ هەڵخەڵەتاندن ***( ~ tactics)***
**diversity** (də-vũr′sə-ti, dī-vũr′sə-ti), ***n.*** (١) هەمەچەشنی؛ هەمەجۆری؛ هەمەشێوەیی: ***( a ~ of activities; There is a great deal of ~ in the American culture.)***
(٢) جیاوازی؛ جیایی
**divert** (də-vũrt′, dī-vũrt′), ***v.t.*** (١) ڕێ پێ گۆڕین (مرۆڤ، شت)؛ لادان؛ لە ڕێ لادان؛ ناراستەکردن؛ گۆڕین؛ وەرگەڕاندن:
***( to ~ the course of a river; to ~ money from one bank to another.)***
(٢) (أ) سەرنج ڕاکێشان؛ خڵافاندن؛ خەریك کردن؛ کات بردنە سەر.
(ب) دڵخۆش کردن؛ کەیف پێدان.
**divest** (də-vest′, dī-vest′), ***v.t.*** (١) داکەندن (جلوبەرگ، چەك)؛ لێکردنەوە. (٢) دەست لێ هەڵگرتن؛ واز لێ هێنان:
***( He ~ed himself of his wealth and became a monk.)***
(٣) لێ سەندنەوە (پلە، ماف، سامان):
***( She was ~ed of her position and rank.)***
**divestiture** (də-ves′tə-chēr, dī-ves′tə-chēr), ***n.*** سەندنەوە (پلەوپایە، ماف، سامان).
**divestment** (də-vest′mənt, dī-vest′mənt), ***n.*** = divestiture.
**divesture** (də-ves′chēr, dī-ves′chēr), ***n.*** = **divestiture.**
**divide** (də-vīd′), ***v.t.*** (١) بەشکردن؛ بەش بەش کردن؛ دابەشکردن
***( We ~d the money equally.)***
(٢) هاوپۆل کردن؛ جۆرجۆرکردن. (٣) جیاکردنەوە.
(٤) کەرتکردن؛ بڕین؛ لەتکردن.
(٥) دابەشکردن (ناکۆکی)؛ دابڕکردن؛ دووبەرەکی خستنەوە:
***( Please don't let such a small matter ~ us.)***
(٦) دابەشکردن (ماتماتیك).
(٧) پلەپلەکردن (مەکینەکاری).
***v.i.*** (١) دابەش بوون؛ لەیەك جیابوونەوە.
(٢) جیابوونەوە (ڕووبار)؛ بوون بە دوو بەشەوە
(٣) دابەش بوون (ناکۆکی)؛ بەش بەش بوون؛ ڕێك نەکەوتن؛ دابڕان
(٤) بەشداربوون
***n.*** (١) سنوور. (٢) ئاوڕێژگە؛ ئاوەڕێژ.
-dividable ***(adj.)***.
**divided** (də-vīd′id), ***adj.*** (١) دابەشکراو؛ بەشکراو؛ کەرتکراو؛ بەش بەش: ***( a ~ land)*** .
(٢) ناکۆك؛ ناڕێك؛ دابڕاو؛ بەش بەش: ***( a ~ party, family or country)***
(٣) جیاکراوە؛ دوو بەش؛ ڕێی هاتوچۆی دووسەرەی لەیەك جیاکراوە، واتە نێوانیان بۆ کراوە: ***( a ~ highway)*** .
**dividend** (div′ə-dend′), ***n.*** (١) ژمارەی بەشکراو (بیرکاری).
(٢) (ا) قازانجی کۆمپانیایەکی هاوبەش.
(ب) بەشی هەر بەشدار یا بەشێك لەم قازانجە.
(ج) بەشی هەر ئەندامێك لە قازانجی زیادە.
**divider** (də-vīd′ēr), ***n.*** (١) بەشکەر.
(٢) بەربەست؛ بەست؛ دیوار؛ پەردەی جیاکەرەوە
(٣) (*pl.*)، پڕگال.
**divination** (div′ə-nā′shən), ***n.*** فاڵ گرتنەوە؛ خەمڵ لێدان؛ پێشبینی.
**divine** (də-vīn′), ***adj.*** (١) خودایی؛ خواهانە؛ خوایانە.
(٢) پیرۆز. (٣) خوداپەرست. (٤) ئاینی. (٥) بەرزو مەزن.
(٦) [Colloq.]، زۆر خۆش؛ زۆر جوان؛ نایاب؛ زۆر باش.
***n.*** (١) قەشە. (٢) زانای ئاینی؛ ئاینزان.
-divinely ***(adv.)***; **divineness** ***(n.)***.
**divine** (də-vīn′), ***v.t.*** (١) فاڵ گرتنەوە؛ خەمڵ لێدان؛ پێشبینی کردن.
(٢) هەستپێکردن یا زانین لەڕێی هەستی خۆیی یا زگماکییەوە
***v.i.*** فاڵ گرتنەوە؛ خەمڵ لێدان؛ پێشبینین.
-diviner ***(n.)***.
**divine right of kings,** مافی خودایی شاکان: ئەو مافەی کە گوایە شاکان لە خوداوە مافیان پێ دراوە بۆ حوکمڕانی کردنی گەلەکانیان
**diving board,** تەختەی لێوە بازدانە ناو گۆمی مەلەوە.
**diving suit,** جلوبەرگی مەلەوانی ژێرئاو (کە قورس و ئاوبڕە).
**divining rod,** داردەستی خەمڵ لێدان بۆ دۆزینەوەی ئاو و کانزای ژێر زەوی.
**divinity** (də-vin′ə-ti), ***n.*** (١) خودایەتی
(٢) خودا؛ خودای بچکۆلە؛ نیمچە خودا.
(٣) دەسەڵات یا تایبەخۆی خودایی؛ ئەوپەڕی پاکی و مەزنی.
(٤) زانستی ئاین. (٥) جۆرە شیرینییەکە.
the Divinity, خودا؛ خودای گەورە.
**divisibility** (də-viz′ə-bil′ə-ti), ***n.*** توانای دابەشکردن بوون؛

شیانی دابەش بوون
**divisible** (də-viz′ə-b'l), *adj.* بەش دەکرێت (ژمارە، شت، شوێن)؛ دەتوانرێت دابەش بکرێت.
**division** (də-vizh′ən), *n.* (١) بەشکردن؛ تایبەتی کردن؛ جیاکردنەوە:
***( D~ of labor is important in industry today.)***
(٢) بەشکردن؛ دابەشکردن (پارە، شت).
(٣) بەش (٤) بەش بەش بوون بۆ دەنگدان.
(٥) سنوور؛ بەربەست؛ بەست؛ دیوار؛ پەردەی جیاکەرەوە.
(٦) ناکۆکی؛ دووبەرەکی؛ نەگونجان؛ جیاوازی بیرورا
(٧) بەش (زانیاری، زانکۆ، کارگە... هتد)؛ لق.
(٨) توخم (زیندەوەرزانی)؛ بابەت؛ بەش.
(٩) دابەشکردن (بیرکاری).
(١٠) هێز (لەشکر)؛ فیرقە (سوپا).
(١١) بەشێکی هێزی دەریایی کە بریتییە لە چوار پاپۆڕ.
**division sign (or mark),** نیشانەی دابەشکردن (بیرکاری)
**divisive** (də-vī′siv), *adj.* دووبەرەکی خەرەوە؛ ناکۆکی خەرەوە
***( a ~ person, act, or tactic)***
**divisor** (də-vī′zẽr), *n.* ژمارەی بەسەردا دابەشکراو (بیرکاری)
**divorce** (də-vôrs′, də-vōrs′), *n.* (١) تەلاق؛ تەڵاقدان؛ جیابوونەوەی تەواوی ژن و مێرد. (٢) جیاکردنەوە؛ لەیەکتر جیاکردنەوە:
***( the ~ between religion and science)***
***v.t.*** (١) تەڵاقدان
(٢) جیاکردنەوە؛ لەیەك جیاکردنەوە: ***( to ~ fact from fiction)*** .
***v.i.*** تەڵاق سەندن؛ تەڵاق وەرگرتن.
**divorcé** (də-vôr′sā′, də-vōr′sā′), *n.* پیاوێکی تەڵاقدراو
**divorcée** (də-vôr′sā′, də-vōr′sā′), *n.* ژنێکی تەڵاقدراو
**divorcee** (də-vôr′sē′, də-vōr′sē′), *n.* کەسێکی تەڵاقدراو (ژن یا پیاو)
**divorcement** (də-vôrs′mənt, də-vōrs′mənt), *n.* تەلاق؛ تەڵاقدان؛ تەڵاق وەرگرتن.
**divulge** (də-vulj′), *v.t.* درکاندن؛ ئاشکراکردن؛ دەرخستن (نهێنی)؛ خستنەڕوو (نهێنی)
**-divulgement** *(n.).*
**divulgence** (də-vul′jəns), *n.* درکاندن؛ ئاشکراکردن؛ دەرخستن.
**divulsion** (də-vul′shən), *n.* بەزۆر لەیەککردنەوە؛ پارچەپارچەکردن.
**Dixie** (dik′si), *n.* ویلایەتە خوارووەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا
**dizziness** (diz′i-nis), *n.* سەرەخوڵێ؛ گێژی؛ وڕی.
**dizzy** (diz′i), *adj.* (١) گێژ؛ وڕ
(٢) دەبێت بەهۆی گێژی یا وڕی. ***( ~ heights)***
(٣) سەر لێ تێکچوو؛ سەر لێ شێواو
(٤) [Colloq.]. گەوج؛ بێ مێشك؛ منداڵانە (ڕەووشت، کردەوە).
**-dizzily** *(adv.).*
**do** (dōō), *v.t.* (١) کردن؛ بەجێهێنان؛ جێبەجێکردن؛ ئەنجامدان
***( ~ a deed; ~ one's duty or work)***
(٢) تەواوکردن؛ تەواوبوون ***( Our work is done.)*** .
(٣) بوون بە هۆ؛ والێکردن ***( Who did this to you?)*** .
(٤) کۆشش کردن؛ کردن: ***( D~ your best.)***
(٥) کردن (کارێکی تایبەتی): ***( ~ the ironing; ~ one's nails)*** .
(٦) کردن (پیشە) ***( What do you ~ for a living?)*** .
(٧) چارەسەرکردن؛ جێبەجێکردن: ***( He did the problem.)*** .
(٨) پێشکەش کردن (شانۆگەری، فیلم): ***( We did Hamlet.)*** .
(٩) نواندن لەسەر شانۆ یا لە فیلمدا: ***( He did Hamlet.)*** .
(١٠) بڕین (ڕێگە) ***( He does a mile in six minutes.)*** .
(١١) گەڕان؛ کردن ***( We did three countries in three weeks.)*** .
(١٢) گۆڕین (لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر)؛ کردن بە:
***( Can we ~ Shakespeare into Kurdish?)***
(١٣) پێدان؛ ڕێزپێدان؛ ڕێزلێگرتن: ***( He did honor to his parents.)***
(١٤) بەش کردن؛ بەس بوون؛ پێویستی بەجێهێنان:
***( This much food will ~ us for two days.)***
(١٥) [Colloq.]، خەڵەتاندن؛ لەخشتەبردن؛ فریودان:
***( You've been done.)***
(١٦) [Colloq.]، کات بردنە سەر لە بەندیخانەدا: ***( He did two years.)*** .
***v.i.*** (١) ڕەفتارکردن؛ هەڵسان و دانیشتن:
***( He does well when treated well.)***
(٢) کردن (چالاکی): ***( D~ , don't talk.)*** .
(٣) چۆن بوون: ***( Mother and child are ~ing well.)*** .
(٤) پێویستی بەجێهێنان؛ شیان: ***( The black dress will ~ .)***
(٥) بە شێوەی کرداری یاریدەدەر بەم مانایانەو بەم شێوانە بەکاردەهێنرێ:
(ا) بۆ دووپاتکردنەوە یا لەسەر سووربوون:
***( Please ~ study.; I did do it.)***
(ب) بۆ پرسیارکردن بەمانای: ئایا:
***( Did you telephone her?; D~ you drink coffee?)***
(ج) بۆ دووپاتکردنەوەی پەسەندنەکردن: ***( D~n't go.)*** .
(د) لە جێی کردارێکی تر: ***( Love me as I ~ you.)*** .
(ه) بۆ پاش و پێشخستن لە ڕستەدا: ***( Little did he realize.)***
*n.* [British Colloq.], (١) ساختە؛ درۆ؛ کەڵەك.
(٢) زەماوەند؛ ئاهەنگ.
do away with, (١) لابردن؛ نەهێشتن؛ خۆ لێ ڕزگارکردن:
***( to do away with unnecessary formalities.)***
(٢) کوشتن: ***( He was done away with.)*** .
do by, ڕەفتارکردن بەرامبەر:
***( to do right by a person; He did very well by her.)***
do for, [Colloq.], (١) فەوتاندن؛ کوشتن؛ لەناوبردن.
(٢) چاکە لەگەڵ کردن؛ ئاگا لێ بوون.
do in, [Slang], (١) کوشتن. (٢) زۆر ماندووکردن؛ هێز لێ بڕین.
do one's bit *or* duty, پێویستی سەرشانی خۆ بەجێهێنان؛ بەشی خۆ کردن؛ بەشداربوون.
**do one's damnedest,** [Colloq.], هەوڵدان بەوپەڕی تواناوە.
**do ( a person) out of (something),** لێ سەندن یا بێبەش کردنی کەسێك لە شتێك بە فێڵبازی
do to, ئازاردان؛ والێکردن (خراپە)؛ دەربارەکردن (ناپەسەندی):
***( What have I done to you?)***
do up, [Colloq.], (١) شتن و ئامادەکردن (جل وبەرگ).
(٢) پێچانەوە. (٣) پرچ شۆڕکردنەوە بەسەر شان و ملدا (ئافرەت).
(٤) ماندووکردن.
do with, کەڵك لێ وەرگرتن.
**do without (something),** دەست لێ هەڵگرتن؛ واز لێ هێنان؛ دەربردن بەبێ.
**have to do with,** پەیوەندی لەگەڵ بوون؛ پێوە خەریك بوون.
**how do you do?** چۆنی؟؛ ڕۆژباش؛ ئەم کاتەت باش؛ خۆشحاڵم بە ناسینت. (ئەم وتەیە لەکاتی بەیەکگەیشتنی برادەر یا بەیەکتر-ناسینی دووکەسدا بەکاردێت وە بە هەمان وتەش وەڵام دەدرێتەوە، واتە هەردوولا هەمان ڕستە بەکاردەهێنن).
لە ئەمەریکا لەباتی ئەمە لەکاتی بەیەکترناسیندا هەردوولا دەڵێن:
( **Nice to meet you.** یا **Nice meeting you.** ).
**make do,** هەڵکردن یا دەربردن بەوەی هەیە یا لەبەردەستدایە.
**doable** (dōō′ə-b'l), *adj.* کردەنی؛ دەتوانرێ بکرێت؛ دەکرێت.
**do-all** (dōō′ôl′), *n.* بەردەست یا کرێکاری گشتی (کە سەری لە هەموو جۆرە کارێك دەربچێت و بیکات).

**doat** (dōt), *v.i.* = dote.
**Doberman pinscher,** جۆرە سەگێکی ڕەشی تووك كورتی پێست
لووسی باریکەلەی گەورەی زۆر دڕە.
**docent** (dō′s'nt), *n.* ڕابەر (بەتایبەتی لە مۆزەخانەدا).
**docile** (dos′'l, dos′il), *adj.* (١) بەئاسانی فێردەکرێت؛ فێردەکرێت.
(٢) دەستەمۆ (مرۆڤ، گیاندار)؛ مل کەچ؛ ماڵی؛ فەقیرۆکە.
-**docility** *(n.)*.
**dock** (dok), *n.* (١) گۆمی کەشتی (بۆ مۆڵخواردن، چاکردن یا بارداگرتن)؛
کەشتیگا (٢) ئەسکەلە؛ شۆستەی بارکردن و بارداگرتنی کەشتی.
(٣) ئاوی نێوان دوو ئەسکەلە
(٤) شۆستە یا شوێنی بارکردن و بارداگرتنی لۆری (لە پشتی کارگە، فرۆشگا
یا شوێنێکی ترەوە).
*v.t.* هێنان یا لێخوڕینی کەشتی بۆناو گۆمی کەشتی.
*v.i.* هاتنەناو گۆمی کەشتییەوە؛ مۆڵ خواردنی (کەشتی).
**dock** (dok), *n.* قەفەزی گومانبار لە دادگادا.
**dock** (dok), *n.* (١) بەشە ڕەقەکەی کلکی گیاندار بەبێ تووکەکەی
(٢) کوتەرەی کلکی بڕاو.
*v.t.* (١) کلك بڕین
(٢) لێ بڕین یا داشکاندنی بەشێکی کرێ یا مووچە:
*( to ~ someone's salary or wages)*
**dockage** (dok′ij), *n.* (١) مزی بەکارهێنانی گۆمی کەشتی یا شوێنی
بارکردن و بارداگرتنی کەشتی. (٢) ئەسکەلە؛ گۆمی کەشتی.
(٣) مۆڵدانی کەشتی؛ ڕاگرتن یا وەستانی کەشتی لە گۆمی کەشتیدا.
**dockage** (dok′ij), *n.* بڕینی بەشێکی کرێ یا مووچە.
**docker** (dok′ēr), *n.* کرێکاری بەندەر
**docket** (dok′it), *n.* (١) پوختەی بڕیاری دادگا؛ لیستەی ئەم بڕیارانە
(٢) کارنامەی دادگا؛ لیستەی ئەو داوایانەی کە دادگایەك دەیبینێت.
(٣) کارنامە؛ لیستەی کار؛ بەرنامە.
(٤) نیشانی بەستەك یا پڕیاسکە (کە ناوکرۆکەکەی ڕوون دەکاتەوە).
*v.t.* (١) تۆمارکردن لە لیستەیەکدا (دادگەری).
(٢) نیشان پێوەنان (بەستەك، پڕیاسکە، پاکەت).
**dockyard** (dok′yärd′), *n.* کارگەی کەشتی چاککردن و دروستکردن.
**doctor** (dok′tēr), *n.* (١) دوکتۆر؛ ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرای هەیە
(٢) پزیشك؛ دەرمانکەر. (٣) پزیشکی خۆماڵی؛ پزیشکی جادووگەر.
(٤) ئامێری شت چاکردنەوەی ناکاوی.
(٥) جانەوەرێکی بچووکی دەستکردە لە ڕاوەماسیدا وەك دان بەکاردەهێنرێت.
(٦) [Rare]، مامۆستا
*v.t.* [Colloq.], (١) دەرمانکردن؛ چاکردنەوە.
(٢) چاکردنەوە (مەکینە، شت).
(٣) دەستکاری کردن (بۆ ساختەو مەبەستی تایبەتی خۆ)؛ گۆڕین:
*( He ~ed the evidence.; He ~ed the wine, food, etc.)*
*v.i.* [Colloq.], (١) پزیشکەوانی کردن
(٢) دەرمان خواردن؛ لەژێر چاودێری پزیشکدا بوون
**doctoral** (dok′tēr-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە دکتۆرا یا دکتۆر؛
هی دکتۆرا *( a ~ dissertation)*
(٢) خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا؛ دوکتۆرا وەرگر.
**doctorate** (dok′tēr-it), *n.* دکتۆرا؛ بڕوانامەی دکتۆرا:
*( He has a ~ in English.)*
**doctrinaire** (dok′tri-nâr′), *n.* بیروباوەڕپەرست؛ کەسێك کە بە
کوێرانە لەسەر بیروباوەڕێك دەڕوات و دەیەوێت بیخاتە کار بەبێ گوێدانە هیچ
شتێك
*adj.* بە کوێرانە شوێن بیروباوەڕ کەوتوو؛ بیروباوەڕپەرست
-**doctrinairism** *(n.)*; **doctrinairian** *(n.)*.
**doctrine** (dok′trin), *n.* (١) ئەو بیروباوەڕو زانستەی فێردەکرێت لە
قوتابخانە یا لە پەرستگادا. (٢) بیروباوەڕ (ئاینی، ڕامیاری، زانستی)؛ ڕێڕەو؛
ڕێباز: *( the church ~ ; the party ~ )*.
-**doctrinal** *(adj.)*.
**document** (dok′yoo-mənt), *n.* (١) بڕوانامە؛ بەڵگەنامە؛
بەڵگەنامەی نووسراو. (٢) بەڵگە؛ قەواڵە.
*v.t.* (١) بەڵگەنامە پێشکەش کردن؛ بەڵگە هێنانەوە یا خستنە پێش چاو.
(٢) ناوبردنی سەرچاوەکانی پەرتووك یا نامیلکەیەك وەك بەڵگەنامە.
(٣) سەلماندن بە بەڵگە.
**documentary** (dok′yoo-men′tə-ri), *adj.* (١) بەڵگەیی؛
بە بەڵگە سەلمێنراو. (٢) تایبەتی بە فیلمێکی بەڵگەنامەیی.
*n.* فیلمی بەڵگەنامەیی کە ڕووداوەکانی ڕاستەقینەو هەڵنەبەستراون
**documentation** (dok′yoo-men-tā′shən), *n.* (١) بڕوانامە
پێشکەش کردن؛ بەڵگەهێنانەوە. (٢) بڕوانامە؛ بەڵگەنامە؛ بەڵگە
**dodder** (dod′ēr), *v.i.* (١) لەرزین (لەبەر پیری).
(٢) بە لارەولار ڕۆیشتن؛ لارەولارکردن؛ لەتردان (لەبەر پیری).
**dodder** (dod′ēr), *n.* ڕووەکێکی لاوورگەی بێ گەڵا و ڕەگ.
**doddered** (dod′ērd), *adj.* (١) بێ لق و پۆپ (لەبەر کۆنی یا نەخۆشی)؛
ووشك (دارودرەخت)؛ ووشك بوو؛ مردوو. (٢) پیرولاواز؛ پەککەوتە؛ خلەفاو.
**doddering** (dod′ēr-iŋ), *adj.* خلەفاو.
**dodeca-** (dō′dek-ə), پێشگرێکە بەمانای: دوانزە.
**dodecagon** (dō-dek′ə-gon′, dō-dek′ə-gən), *n.* ڕوویەك یا
شێوەیەکی دوانزەگۆشەیی یا دوانزەلایی.
**dodecahedron** (dō′dek-ə-hē′drən), *n.* شێوەیەکی دوانزە-
ڕوویی.
**dodge** (doj), *v.t. & v.i.* (١) خۆلادان؛ خۆپاراستن؛ خۆشاردنەوە؛
خۆدزینەوە: *( to ~ a bullet, a person, etc.)*.
(٢) خۆ بەدەستەوە نەدان بە فێڵبازی؛ خۆدزینەوە لە شتی ناخۆش و گێچەڵاوی
(بە ساختەو فێڵ و تەڵەکە): *( to ~ a question)*.
*n.* (١) خۆلادانێك؛ خۆ لێ لادان؛ خۆدزینەوە.
(٢) فێڵ و تەڵەکە (بۆ خۆ بەدەستەوە نەدان). (٣) پیلان؛ نەخشەیەکی زیرەکانە
**dodger** (doj′ēr), *n.* (١) خۆلادەر؛ خۆبەدەستەوەنەدەر.
(٢) کەسێکی ساختەچی و ناپاك؛ کەسێکی فێڵباز و سەرچەوت.
(٣) بڵاوکراوەیەکی بەدەست بەشراوە.
(٤) کێکێك کە لە ئاردی گەنمەشامی دروست کرابێت.
**dodo** (dō′dō), *n.* (١) باڵندەیەکی قرتێکەوتووە لە قەلەموون دەچێت.
(٢) کەسێکی کۆنەپەرست (لە ڕەوشت و جل و بەرگ و بیروباوەڕدا)؛
کەسێکی بێ مێشك، کەر، یا گەوج.
**doe** (dō), *n.* مێینەی ئاسك، مەڕەکێوی، یا کەروێشك.
**doer** (dōō′ēr), *n.* (١) بکەر؛ کردە: *( a ~ of good)*.
(٢) کەسێکی چوست و چالاك؛ کەسێکی کارجێبەجێکەر یا ڕاپەڕێنەر.
**does** (duz), *the third person singular of* **do.**
**doeskin** (dō′skin′), *n.* (١) پێستەی مێی ئاسك.
(٢) قوماشێکی خوری نەرمی ساف و لووسە.
**doesn't** (duz′'nt), = **does not.**
**doff** (dof, dôf), *v.t.* (١) جل داکەندن.
(٢) شەپقە بەرزکردنەوە یا داکەندن لەکاتی سڵاوکردندا (نیشانەی ڕێزگرتنە).
(٣) فڕێدان؛ لادان؛ دەست لێ هەڵگرتن.
**dog** (dôg), *n.* (١) سەگ.
(٢) کەسێکی خوێڕی و پیس و بۆگەن؛ کەسێکی بێ نرخ.
(٣) [Colloq.]، کوڕ؛ کابرا: *( lucky ~ )*.
(٤) [Slang]، پێ؛ قاچ. (٥) [D-]، ناوی کۆنەستێرەیەکە. (٦) گیرە.
*v.t.* (١) شوێن کەوتن؛ دواکەوتن؛ ڕاوکردن. (٢) گرتن (بە گیرەیەك).
*adv.* زۆر؛ ئێجگار: *( ~ tired)*.
**a cat and dog life,** هەمیشە شەڕو دەمەقاڵێ بوون (ژن و مێرد).
**a dog in the manger,** کەسێك کە شتێك بەکارناهێنێت و ناهێڵێت کە
کەسی تریش بەکاری بهێنێت و سوودی لێ وەربگرێت.

**be top dog,** له هه‌موو كه‌س ده‌سه‌لات زیاتر بوون.
**be under dog,** ژێرده‌سته‌بوون؛ له‌ژێر چه‌پۆكدا بوون.
**dog eat dog,** ململانێیه‌كی سه‌ختی دڵڕه‌قانه؛ ژیانێكی بێ به‌زه‌یی.
**every dog has his day,** هه‌مووكه‌سێك ڕۆژی خۆی هه‌یه.
**give (or throw) to the dogs,** فڕێدان (له‌به‌ر بێ نرخی).
**go to the dogs,** [Colloq.]. دانه دواوه؛ به‌ره‌و خراپی چوون.
**lead a dog's life,** ژیانێكی ناخۆش و پڕ ئه‌شكه‌نجه بردنه‌سه‌ر.
**let sleeping dogs lie,** شت ده‌ستكاری نه‌كردن و نه‌شڵه‌ژاندن له ترسی ئه‌وه‌ی نه‌وه‌كو خراپتر بێت.
**teach an old dog new tricks,** هه‌وڵدان بۆ گۆڕینی خوو نه‌ریت و بیروڕای ساڵه‌های ساڵی كه‌سێك.

**dog collar,** (١) قایشی ملی سه‌گ.
(٢) [Slang]. یه‌خه‌ی قه‌شه.
(٣) (ا) ملوانكه‌یه‌كی پڕبه‌پڕی مل. (ب) یه‌خه‌یه‌كی ته‌سكی به‌رز.

**dog-fight** (dôg'fīt'), *n.* (١) (ا) شه‌ڕه سه‌گ. (ب) شه‌ڕی ده‌سته‌ویه‌خه.
(٢) شه‌ڕی نێوان دوو فڕۆكه‌ی جه‌نگی یا زیاتر.

**dogfish** (dôg'fish'), *n.* (١) جۆره كۆسه‌یه‌كی بچووكی ئه‌وسنه.
(٢) جۆره ماسی‌یه‌كه.

**dogged** (dôg'id), *adj.* كۆڵنه‌ده‌ر؛ سه‌رسه‌خت؛ كه‌لله‌ڕه‌ق.

**doggerel** (dôg'ẽr-əl, dog'ẽr-əl), *n.* هۆنراوه‌یه‌كی هیچ‌وپووچی قۆشمه.
*adj.* تایبه‌تی به هۆنراوه‌یه‌كی هیچ‌وپووچ و قۆشمه.

**doggery** (dôg'ẽr-i), *n.* (١) ڕه‌وشتی ناشرینی سه‌گانه.
(٢) سه‌گ به‌گشتی؛ سه‌گ. (٣) لات‌وله‌وێڕ؛ ڕووته؛ هه‌رچی‌وپه‌رچی.

**doggish** (dôg'ish), *adj.* (١) سه‌گی؛ سه‌گانه؛ وه‌ك سه‌گ.
(٢) ڕه‌وشت ناشرین. (٣) [Colloq.]، ڕازاوه و خۆنوێن.

**doggone** (dôg'gôn'), *interj.* له‌عنه‌تی؛ به له‌عنه‌ت بێ؛
وته‌یه‌كه له‌كاتی تووڕه‌یی، سه‌رسامی، یا خۆشیدا ده‌وترێت.
*v.t.* [Colloq.], به له‌عنه‌ت كردن

**doggy** (dôg'i), *adj.* سه‌گێكی بچووك؛ ناوی منداڵانه بۆ سه‌گ.
*adj.* (١) سه‌گی؛ سه‌گانه. (٢) [Colloq.]، ڕازاوه و خۆنوێن.

**doghouse** (dôg'hous'), *n.* كولانه سه‌گ.
**in the doghouse,** [Slang], فڕێ دراوه‌ته ده‌ره‌وه (له‌به‌ر به‌دڕه‌فتاری)؛ ڕقی لێ هه‌ڵگیراوه له‌به‌ر بێ حه‌یایی.

**dog-legged** (dôg'leg'id, dôg'legd'), *adj.* چه‌ماوه

**dogma** (dôg'mə, dog'mə), *n.* (١) ووشكه بروا؛ بروای بێ به‌ڵگه؛ بروا. (٢) بروا (ئاین).

**dogmatic** (dôg-mat'ik, dog-mat'ik), *adj.* (١) بروا ووشك؛ ووشكه بروا په‌رست. (٢) سوور له‌سه‌ر بەبێ به‌ڵگه.
**-dogmatically** *(adv.).*

**dogmatics** (dôg-mat'iks, dog-mat'iks), *n.pl.* لێكۆڵینه‌وه‌ی بیروباوه‌ڕی ئاینی (به‌تایبه‌تی خاچ په‌رستی).

**dogmatism** (dôg'mə-tiz'm, dog'mə-tiz'm), *n.* ووشكه-بروایی؛ بروا‌په‌رستی بێ به‌ڵگه.

**dogmatist** (dôg'mə-tist, dog'mə-tist), *n.* ووشكه بروا په‌رست؛ برواپه‌رستی بێ به‌ڵگه.

**do-gooder** (dōō'gŏŏd'ẽr), *n.* [Colloq.], چاكه‌كه‌رێكی ساوێلكه

**dog paddle,** سه‌گه مه‌له.

**dog tag,** نیشانه‌یه‌كی ئاسنه ده‌كرێته ملی سه‌گه‌وه كه ناو و نیشانی سه‌گه‌كه‌ی له‌سه‌ر هه‌ڵده‌كه‌نرێت.

**dog-tired** (dôg'tīrd'), *adj.* [Colloq.], زۆر ماندوو

**dogtrot** (dôg'trot'), *n.* لۆقه (وه‌ك لۆقه‌ی سه‌گ).

**dogwood** (dôg'wood'), *n.* (١) دره‌ختێكه زۆر زوو له به‌هاردا گوڵی سپی و په‌مه‌یی ده‌گرێت. (٢) داری ئه‌م دره‌خته

**doily** (doi'li), *n.* پارچه‌یه‌ك قوماش، ئاوریشم، یا كاغه‌زی نه‌قشداری بچووكه له‌سه‌ر مێز و ڕه‌فه داده‌نرێت و شتی ده‌خرێته سه‌ر.

**doings** (dōō'iŋz), *n.pl.* (١) كردار؛ كرده‌وه.
(٢) ڕه‌فتار؛ ڕه‌ووشت.

**doit** (doit), *n.* (١) پاره‌یه‌كی هۆڵه‌ندی كۆنی كه‌م نرخه.
(٢) شتێكی هیچ‌وپووچ و بێ نرخ: *( not worth a ~ )*.

**doldrums** (dol'drəmz), *n.pl.* (١) په‌ستی؛ بێ تاقه‌تی؛ دڵته‌نگی؛ بێ ووزه‌یی؛ بێ جم‌وجووڵی. (٢) (ا) ده‌ریای ناوچه‌ی هێڵی یه‌كسان كه به خامۆشی و بای بێ هێز ناسراوه. (ب) بای بێ هێزی ئه‌م ناوچانه.
**in the doldrums,** په‌ست؛ غه‌مبار؛ بێ تاقه‌ت؛ دڵته‌نگ.

**dole** (dōl), *n.* (١) خێركردن به هه‌ژار. (٢) خێر.
(٣) شتێك كه نه‌خته نه‌خته بدرێت.
(٤) یارمه‌تی میری بۆ كه‌سانی بێكار و بێ ده‌رامه‌ت.
(٥) [Archaic]، چاره‌نووس.
*v.t.* ( ~ **out** ), خێرپێكردن؛ پێدان (خێر، یارمه‌تی، ده‌ستگیرۆیی).
**on the dole,** یارمه‌تی له میری‌یه‌وه وه‌رگرتن له‌به‌ر بێ ده‌رامه‌تی؛ به یارمه‌تی میری ژیان.

**dole** (dōl), *n.* [Archaic], غه‌مباری؛ دڵته‌نگی؛ په‌ستی؛ خه‌فه‌تباری.

**doleful** (dōl), *adj.* غه‌مگین؛ شیوه‌نی؛ خه‌فه‌تاوی

**doll** (dol), *n.* (١) بووكه‌شووشه؛ بووكی منداڵان.
(٢) كچێك یا ژنێكی جوان به‌ڵام بێ مێشك. (٣) منداڵێكی جوانكیله
(٤) [Slang]، كچ؛ ژنێكی گه‌نج.
*v.t. & v.i.* ( ~ **up** ), خۆ ڕازاندنه‌وه؛ جلی جوان له‌به‌ركردن؛ خۆڵه‌ته‌لدان.

**dollar** (dol'ẽr), *n.* دۆلار: دراوی ئه‌مه‌ریكا، كه‌نه‌دا و ئوسترالیا.

**dollar diplomacy,** دیبلۆماسی‌یه‌تی دۆلار: به‌كارهێنانی پاره بۆ كاركردنه سه‌ر وولاتێكی تر.

**dollar sign,** نیشانه‌ی دۆلار **$** كه له‌پێش ژماره‌كه‌وه ده‌نووسرێ.
(بۆ نموونه: **$ 10.00** ، واته " ده " دۆلار).
(هه‌روه‌ها پێشی ده‌وترێ: **dollar mark** ).

**dolly** (dol'i), *n.* (١) بووكه‌شووشه (به زمانی منداڵان).
(٢) عه‌ره‌بانه‌ی ده‌ستی بۆ گواستنه‌وه‌ی شتی قورس.

**dolman** (dol'mən), *n.* (١) عه‌با یا ڕۆبێكی توركی زۆر ده‌ڵب.
(٢) عه‌با یا جۆره پاڵتۆیه‌كی ژنانه‌ی قۆڵ ده‌ڵب.

**dolmen** (dol'men), *n.* گۆڕێكی زۆر كۆنه بریتی‌یه له تاشه به‌ردێك كه ده‌خرێته سه‌ر چه‌ند كێله‌به‌ردێك و به قنجی داده‌نرێت.

**dolor** (dō'lẽr), *n.* [Poetic], خه‌فه‌ت؛ خه‌م؛ دڵته‌نگی

**dolorous** (dol'ẽr-əs, dō'lẽr-əs), *adj.* (١) غه‌مبار؛ غه‌مگین؛ شیوه‌نی؛ خه‌فه‌تبار. (٢) ناخۆش؛ پڕ ئێش و ئازار.

**dolphin** (dol'fin), *n.* (١) دۆلفین: گیاندارێكی ده‌ریایی‌یه له ئه‌مه‌نگ ده‌چێت درێژی‌یه‌كه‌ی شه‌ش تا هه‌شت پێ‌یه. (٢) [D-]، كۆئه‌ستێره‌یه‌كه.

**dolt** (dōlt), *n.* كه‌سێكی كه‌ری بێ مێشك.

**doltish** (dōl'tish), *adj.* كه‌ر؛ بێ مێشك.

**-dom** (dəm), پاشگرێكی ناوپێكهێنه‌ره به‌مانای: (ا) پله یا ناوچه: **( earldom, Kingdom)**
(ب) بارێكی گشتی: **( freedom, wisdom)** .
(ج) سه‌رجه‌می تاقمێك یا كۆمه‌ڵێك: **( officialdom)** .

**domain** (dō-mān'), *n.* (١) ناوچه‌ی ژێرده‌ستی فه‌رمانڕه‌وایه‌ك.
(٢) موڵك؛ زه‌وی‌وزاری كه‌سێك؛ خانووبه‌ره.
(٣) مه‌یدان؛ مه‌ودای شاره‌زایی: *( the ~ of science)* .

**dome** (dōm), *n.* (١) گوومه‌ز.
(٢) [Poetic]، خانوویه‌كی گه‌وره و جوان.
(٣) [Slang]، سه‌ر؛ كه‌لله‌سه‌ر.
*v.t.* (١) به گوومه‌ز داپۆشین. (٢) كردن به گوومه‌ز.
*v.i.* وه‌ك گوومه‌ز لێهاتن؛ ئاوسان.

**domestic** (də-mes'tik), *adj.* (١) خانه‌كی؛ ناوماڵ؛ هی ناوماڵ؛ خێزانی: *( ~ happiness; ~ trouble)* .

(٢) ناوخۆ؛ ناوەکی؛ ناوخۆیی: ***( D~ and foreign issues arose .)*** .
(٣) خۆماڵی ***( ~ products)*** . (٤) ماڵی (گیانداں): ***( a ~ animal)*** .
(٥) حەزکەر لە ماڵەوەو لە کاروباری ماڵەوە.
***n.*** (١) بەردەستی ناوماڵ (کارەکەر، چێشتکەر، بەردەست).
(٢) (*pl.*)، بەرهەمی خۆماڵی یا ناوخۆ.
**-domestically *(adv.)*.**
**domesticate** (də-mes′tə-kāt′), ***v.t.*** (١) ماڵی کردن (گیاندار).
(٢) دەستەمۆکردن.
***v.i.*** ماڵی بوون؛ ڕاهاتن بە ماڵ؛ دەستەمۆبوون.
**-domestication *(n.)*.**
**domesticity** (dō′mes-tis′ə-ti), ***n.*** (١) ژیانی خێزانی؛
ژیانی ناوماڵ (٢) خۆتەرخانکردن بۆ خێزان و ژیانی خێزانی؛ ماڵێتی.
(٣) (*pl.*)، کاروباری ناوماڵ.
**domestic worker,** بەردەستی ناوماڵ (کارەکەر، چێشتکەر).
**domicile** (dom′ə-sil, dom′ə-sīl′), ***n.*** ماڵ؛ مەلبەند؛
نیشتەجێی هەمیشەیی.
***v.t.*** نیشتەجێبوون؛ نیشتەجێ کردن.
**dominance** (dom′ə-nəns), ***n.*** زاڵی؛ نێری؛ دەسەلات ڕۆیشتن؛
دەستبالایی
**dominancy** (dom′ə-nan-si), ***n.*** = **dominance.**
**dominant** (dom′ə-nənt), ***adj.*** (١) زاڵ؛ بەدەسەلات؛ دەسەلاتدار؛
نێر ***( a ~ voice in the parliament)*** .
(٢) گرنگترین؛ سەرەکی: ***( the ~ partner in a business)*** .
**dominate** (dom′ə-nāt′), ***v.t. & v.i.*** (١) بەسەردا زاڵبوون؛
خستنە ژێر دەستەوە؛ بەڕێوەبردن؛ دەست بەسەردا ڕۆیشتن؛ دابینکردن:
***( She ~s her husband.)***
(٢) بەسەردا ڕوانین؛ لە دەوروبەر بەرزتربوون:
***( This building ~s the city.)***
**-dominator *(n.)*.**
**domination** (dom′ə-nā′shən), ***n.*** (١) دەسەلات بەسەردا بوون؛
زاڵی خستنە ژێر دەستەوە؛ بەسەردا زاڵبوون:
***( the ~ of one group by another)***
(٢) ... فریشتەی چوارەم پلە (ئاین)
**domineer** (dom′ə-nêr′), ***v.i.*** زەبر بەسەردا نواندن؛ ترساندن؛
بە زۆر بەسەردا سەپاندن (بیروڕا)؛ دابینکردن بە دڵڕەقی.
**domineering** (dom′ə-nêr′iŋ), ***adj.*** بەزەبر؛ گونە؛ گوندار؛ زاڵ؛
کەڵەمێرد ***( a ~ woman)***
**dominion** (də-min′yən), ***n.*** (١) دەسەلات؛ دەست بەسەردا ڕۆیشتن.
(٢) وولات؛ ناوچەی ژێردەستی فەرمانڕەوا یا فەرمانڕەوایییەک.
(٣) [D-]، یەکێك لە وولاتە ئەندامەکانی خۆبەڕێوەبەری کۆمنوێڵسی بەریتانی:
***( the D~ of Canada)***
**domino** (dom′ə-nō′), ***n.*** (١) پوولی دۆمینە
(٢) دۆمینە؛ یاری دۆمینە. (٣) کەوایەك یا عەبایەکی دەلبی کلاودار بۆ
دەماخ کردن (٤) دەماخ. (٥) کەسێکی دەماخ کار.
**don** (don), ***n.*** (١) [D-]، دۆن: سەرناوێکی ئیسپانییە وەك " Mr. " ی
ئینگلیزی (٢) بەگزادەیەکی ئیسپانی. (٣) کەڵەپیاو.
(٤) [Colloq.]، سەرۆك یا مامۆستای کۆلیجێکی زانکۆی ئۆکسفۆرد یا
کامبردج
**don** (don), ***v.t.*** جل لەبەرکردن؛ جلێکی تایبەتی لەبەرکردن.
**donate** (dō′nāt), ***v.t.*** باربووکردن؛ باربوودان؛ پیتاك کردن؛ پیتاکدان؛
پارە بەخشین لەڕێی چاکەدا.
**-donator *(n.)*.**
**donation** (dō-nā′shən), ***n.*** باربوو؛ باربووکردن؛ پیتاك؛
پارە بەخشین لەڕێی چاکەدا.
**done** (dun), *past participle of* **do.**
***adj.*** (١) تەواو؛ تەواوبوو؛ دوایی هاتوو؛ تەواوکراو.
(٢) باش کوڵاوە؛ بەگوێرەی پێویست کوڵاوە.
**donee** (dō-nē′), ***n.*** باربوو بۆ کراو؛ پیتاك بۆ کراو.
**Don Juan** (don jōō′ən), (١) دۆن جوان: بەگزادەیەکە لە ئەفسانەی
ئیسپانیدا کە گەلێك دۆستی ژن بووەو پاش جووت بوون وازی لێ هێناون
(٢) پیاوێك کە دڵدارو دۆستی ژنی زۆر بێت و زوو زوو وازیان لێ بهێنێت.
**donkey** (doŋ′ki, duŋ′ki), ***n.*** (١) کەر؛ گوێ درێژ.
(٢) کەسێکی کەر یا کەللەڕەق.
**donor** (dō′nẽr), ***n.*** بدەر؛ بەخشندە؛ پێدەر: ***( a blood ~ )*** .
**don't** (dōnt), = **do not.**
**donut** (dō′nut′), ***n.*** = **doughnut.**
**doodle** (dōō′d'l), ***v.t.*** [Archaic], زوڕناژەندن.
***v.i.*** (١) کات کوشتن؛ خۆ خەریك کردن؛ جادەپێوان (مەجاز).
(٢) وێنەکێشانی لامسەرلایی یا قەڵەبەلی نووسین لەکاتێکدا سەرنجت لای
شتێکی ترە یا گوێت لە شتێك گرتووە.
***n.*** (١) کەسێکی بێ مێشك و کەر.
(٢) وێنە، نەخشە، یا نووسینی لامسەرلایی کە لەکاتێکدا کرابێت سەرنجی
نەخشەکێشەکە لای شتێکی تر بووبێت یا گوێی لە شتێکی تر گرتبێت
**doom** (dōōm), ***n.*** (١) فەرمان.
(٢) بڕیاری دادگا؛ بڕیار بە سزادان؛ سزا. (٣) چارەنووس.
(٤) مردن؛ فەوتان؛ نەمان. (٥) ڕۆژی قیامەت.
***v.t.*** (١) سزا بەسەردا دان؛ سزا بۆ دانان یا بڕینەوە.
(٢) چارەنووسێکی ڕەش بۆ بڕینەوە؛ ژێرخستن.
**doomsday** (dōōmz′dā′), ***n.*** (١) ڕۆژی قیامەت.
(٢) ڕۆژی لێپرسینەوە.
**door** (dôr, dōr), ***n.*** (١) دەرگا؛ دەروازە؛ قاپی
(٢) خانوو؛ ژوور؛ ماڵ: ***( two ~s down the hall)*** .
(٣) کون؛ شوێنی چوونەژوورەوە.
**lay at the door of,** هێنان بەسەردا؛ لۆمەکردن (بۆ کردنی هەڵەیەك)
**out of doors,** دەرەوە؛ لە دەرەوەی ماڵ.
**show a person the door,** دەرکردن (لە ماڵ یا ژوورەکەت)
**doorbell** (dôr′bel′, dōr′bel′), ***n.*** زەنگی دەرگا
**doorjamb** (dôr′jam′, dōr′jam′), ***n.*** بەشی ستوونی چوارچێوەی
دەرگا.
**doorkeeper** (dôr′kēp′ẽr, dōr′kēp′ẽr), ***n.*** دەرگاوان.
**doorman** (dôr′man′, dôr′mən, dōr′man′), ***n.*** دەرگاوان.
**doormat** (dôr′mat′, dōr′mat′), ***n.*** پارچە حەسیر یا فەرشێك کە
لەبەر دەرگا دادەنرێت بۆ پاکردنەوەی بنی پێڵاو پێش چوونەژوورەوە
**doorstep** (dôr′step′, dōr′step′), ***n.*** پێپلیکەی بەردەرگای
دەرەوە؛ بەردەرگای دەرەوە.
**doorway** (dôr′wā′, dōr′wā′), ***n.*** کون؛ شوێنی چوونەژوورەوە؛
دەرگا.
**dope** (dōp), ***n.*** (١) شلە یا ڕۆنی چەورکردن یا هەڵمژین.
(٢) شلەیەکی گیراوەیە دەدرێت لەڕووی شت بۆ پاراستنی.
(٣) دەرمانێکە دەدرێت بە ئەسپی پێشبڕکێ بۆ خێرا ڕاکردن.
(٤) [Slang]، دەرمانی سەرخۆشکەر؛ تلیاك؛ دەرمانی بێهۆشکەر.
(٥) [Slang]، دەنگوباسی تایبەتی کە لەپێش خەڵکدا پێت بگات بۆ
پێشبینی کارێك یا ڕووداوێك. (٦) [Slang]، تلیاك خۆر.
(٧) [Slang]، کەسێکی سست و بێ مێشك و بێ ئاگا.
***v.t.*** (١) تلیاکی دەداتێ؛ دەرمانی بێهۆشکەری دەداتێ.
(٢) [Slang]، ( **~ out** )، لێکدانەوە؛ بۆ دەرکەوتن یا پێشبینین بەپێی ئەو
دەنگوباسەی کە هەیە.
**dope fiend,** [Slang]. تلیاك خۆر.
**dopey** (dō′pi), ***adj.*** [Slang]. (١) تلیاکی کێشاوە؛ تلیاك لێی داوە.
(٢) سست و سەرلێ شێواو؛ بێ مێشك؛ کەر

**dorm** (dôrm), ***n.*** [Colloq.], = **dormitory.**
**dormant** (dôr′mənt), ***adj.*** (١) خامۆش؛ نووستوو؛ کپ
***( a ~ volcano)***
(٢) سڕ (گیاندار)؛ نەبزووت: ***( a ~ plant; Snakes are ~ in winter.)*** .
(٣) وەستاو (ئاو)؛ مەنگ؛ پەنگ خواردوو.
**-dormancy** ***(n.).***
**dormitory** (dôr′mə-tôr′i, dôr′mə-tō′ri), ***n.*** شوێنی نیشتەجێ
بوونی قوتابیانی دوور لە ماڵ؛ بەشی ناوخۆی قوتابی (کوڕ یا کچ).
**dormouse** (dôr′mous′), ***n.*** گیاندارێکە لە سمۆرە دەچێت.
**dorsal** (dôr′s'l), ***adj.*** بەپشتەوە؛ تایبەتی بە پشت
**dorsum** (dôr′səm), ***n.*** (١) پشتی گیاندار.
(٢) پشت ***( the ~ of the hand)*** .
**dosage** (dōs′ij), ***n.*** (١) دەرمان پێدان بەپێی خۆراکێکی تایبەتی
(٢) ژەمە دەرمان. (٣) شتی زیادە کردنە ناو مەیەوە بۆ تام یا تین.
**dose** (dōs), ***n.*** (١) ژەمە دەرمان.
***( The bottle contains six ~s.)***
(٢) (ا) بڕ؛ هەند.
(ب) ژەم (سزا، تەمێ، چارە، مەرایی... هتد).
***( a ~ of flattery, punishment, etc.)***
(٣) شتێکی زیادە کە دەکرێتە مەیەوە بۆ تام یا تین
(٤) [Slang]. سووزەنەک
***v.t.*** (١) ژەمە دەرمان پێدان (٢) شتی زیادە کردنە مەیەوە بۆ تام یا تین
***v.i.*** ژەمە دەرمان خواردن
**dosimeter** (dō-sim′ə-tēr), ***n.*** پێوەری ژەمە دەرمان
**-dosimetry** ***(n.).***
**dossier** (dos′i-ā′, dos′i-ēr), ***n.*** دۆسیە؛ فایلی تایبەتی کەسێک
**dot** (dot), ***n.*** (١) خاڵ (٢) لەکە؛ شتێکی بچووک وەک خاڵ.
***v.t.*** (١) خاڵ لەسەر دانان
(٢) بە خاڵ دروستکردن. ***( a ~ted line, map, sketch, etc.)*** .
(٣) داپۆشین (هەر وەک بە خاڵ) ***( Gas stations ~ted the landscape.)*** .
**dot one's *i*'s and cross one's *t*'s,** زۆر بەووردی ڕوونکردنەوە؛
دوا شت کردن لە تەواوکردنی کارێکدا.
**on the dot,** [Colloq.]. لە کاتی خۆیدا بەتەواوی؛
دەقاودەق لەکاتی خۆیدا.
**dot** (dot), ***n.*** مارەیی
**dotage** (dōt′ij), ***n.*** (١) خلەفاوی؛ مێشک سووکی (بەهۆی پیرییەوە)؛
خلەفان (٢) خۆشەویستی و بەدەورڕقنگدا هاتنێکی لەڕادەبەدەر.
**dotard** (dō′tērd), ***n.*** کەسێکی خلەفاو؛ کەسێکی مێشک سووک (پیری)
**dote** (dōt), ***v.i.*** (١) خلەفان؛ مێشک سووک بوون
(٢) ( ~ on; ~ upon )، لەڕادەبەدەر خۆشویستن و بەدەورقنگدا هاتن
**doth** (duth), شێوەی کۆنی کرداری یاریدەدەری ( does ) ە بۆ کەسی
سێیەمی تاک
**doting** (dōt′iŋ), ***adj.*** (١) لەڕادەبەدەر خۆشەویست و بەدەورڕقنگدا
هاتوو (٢) داڕزاو لە پیریدا (ڕووەکناسی)
**dotty** (dot′i), ***adj.*** (١) خاڵ خاڵاوی
(٢) [Colloq.]. شلۆق؛ لاواز؛ بێ هێز
(٣) [Colloq.]. خلەفاو؛ مێشک سووک؛ شێتۆکە
**double** (dub′'l), ***adj.*** (١) جووتە؛ دوان؛ دوو؛ دوانە؛ جووت
(٢) دوو ئەوەندە؛ دوو جار. (٣) دوو توێ؛ دوو چین
(٤) دوانەی جیاواز؛ دووی جیاواز: ***( a ~ standard)*** .
(٥) دوو مانا بەخش؛ لێڵ
(٦) دوو قات؛ دوو ئەوەندە ***( to pay ~ fare)*** .
(٧) دوانە؛ دووکەسە ***( a ~ bed)***
(٨) دووڕوو؛ خەڵەتێنەر؛ دووزمان
***adv.*** (١) دوو ئەوەندە؛ دوو قات (٢) دوان؛ دوو جار؛ دوو کەڕەت

(٣) دوانە؛ جووتە؛ جووت.
***n.*** (١) شتێکی دوو ئەوەندەیی؛ دوو ئەوەندە.
(٢) وێنەی دەقاودەق: ***( He is his father's ~ .)*** .
(٣) ئەکتەری بریتی یا جێگر؛ بریکار. (٤) توێ؛ قەد
(٥) وەرگەڕانێکی کوتوپڕانە؛ ناڕاستە گۆڕین. (٦) فێڵ.
(٧) ***(pl.)***، یاری دوانە (وەک یاری تەنس کە لەباتی یەک کەس هەر لە لایەک
دووکەس یاری بکەن).
***v.t.*** (١) دوو ئەوەندە کردن؛ کردن بە دوو قات.
(٢) پێچانەوە؛ قەدکردن: ***( ~ the bandage)*** .
(٣) وێنەی دەقاودەق گرتن؛ وێنەی دەقاودەق بوون.
(٤) بەدەوردا ڕۆیشتن بە کەشتی: ***( The ~ Cape Horn.)*** .
***v.i.*** (١) بوون بە دوو ئەوەندە؛ دوو قات زیادبوون.
(٢) وەرگەڕانەوە بۆ دواوە.
(٣) لە بریتی کەسێکی تر کارکردن کە وێنەی دەقاودەق بێت (فیلمی سینەما)
**double up,** (١) نووقاندن (مستەکۆڵە)؛ قووچاندن.
(٢) چەمینەوە یا نووشتانەوە (لە ئازار یا پێکەنیندا).
(٣) بەشداری کردنی کەسێکی تر لە ژوور، جێگەی نووستن، خانوو، یا
کورسییەکدا کە خۆی تەنها هی یەک کەسی بێت.
**double bed,** جێی دووکەسی؛ چەرپایەی دووکەسی.
**double chin,** غەبغەبە؛ دوو چەناگە.
**double-cross** (dub′'l-krôs′), ***v.t.*** [Slang], ناپاکی لەگەڵ کردن؛
دەستبڕین؛ فرۆشتن (مەجاز)؛ بەسەرزاری لەگەڵ بوون و لەژێرەوە دژبوون؛
دووڕوویی لەگەڵ کردن.
**double dagger,** نیشانەی دوو خەنجەر ( ‡ ) کە لە چاپەمەنیدا بۆ
تێبینییەکی تایبەتی بەکاردەهێنرێت.
**double date,** [Colloq.], جووتە ژوان: چوونەدەرەوەی دوو کوڕو
دوو کچ پێکەوە بۆ شوێنێک.
**double-dealer** (dub′'l-dēl′ēr), ***n.*** کەسێکی بێبارو ناپاک؛
کەسێکی دووڕوو.
**double-dealing** (dub′'l-dēl′iŋ), ***n.*** دووڕوویی؛ ناپاکی؛ بێباری
**double-decker** (dub′'l-dek′ēr), ***n.*** (١) پاسێکی دوو نهۆمی؛
شتێکی دوو نهۆمی (ئوتومبیل، شەمەندەفەر، خانوو... هتد).
(٢) [Colloq.]، ساندویچێکی دوو ناوناخنی یا دوو قات.
**double-edged** (dub′'l-ejd′), ***adj.*** (١) دوو دەمی تیژی هەیە-
(شمشێر، چەقۆ، بیروباوەڕ)؛ لە هەردوو دیوەوە دەبڕێت: ***( a ~ sword)***
(٢) بەکاردەهێنرێت بۆ پاڵپشتی کردن و دژوەستانیش.
**double-entendre** (dōō′bl'-än′tän′dr'), ***n.*** (١) ووشەی دوو-
مانا (بەتایبەتی کە مانایەکیان شاراوەو پیس و بێ ئابڕووانە بێت)؛
ووتەی بەتوێکڵ. (٢) بەکارهێنانی ئەم جۆرە ووتانە لە ئاخاوتندا؛ لێڵی.
**double entry,** دەفتەرگری دوولایی
**double-faced** (dub′'l-fāst′), ***adj.*** (١) دووڕوو (قوماش، کاغەز،
جل‌وبەرگ... هتد). (٢) دووڕوو؛ بێبار؛ ناپاک؛ دووزمان.
**double feature,** دوو فیلمی سینەمایی پێکەوە.
**double-header** (doub′'l-hed′ēr), ***n.*** (١) شەمەندەفەرێک کە دوو
مەکینە ڕای بکێشێت. (٢) دوو یاری کە دوو تیپ لە هەمان ڕۆژدا بیکەن (یاری
بێسبۆڵ).
**double indemnity,** بۆ بژاردنی دوو قات لەئەنجامی مردنی ڕێکەوتدا
(بیمەی ژیان).
**double-minded** (dub′'l-mīnd′id), ***adj.*** ڕاڕا؛ دوودڵ.
**double-park** (dub′'l-pärk′), ***v.t. & v.i.*** وەستاندنی ئوتومبیلێک
بەتەنیشت ئوتومبیلێکی ترەوە لەسەر شەقام (کە کردارێکی قەدەغەیە).
**double-space** (dub′'l-spās′), ***v.t. & v.i.*** دێڕ پەڕاندن (لە نووسین
یا چاپکردندا).
**double standard,** بانێکەو دوو هەوا؛ بە دوو چاو سەیری شت کردن
**doublet** (dub′lit), ***n.*** (١) چاکەتێکی پیاوانەی تەسکی قۆڵدار یا بێ

قۆل. (٢) هەریەکە لە جووتی شتی هاوچەشن. (٣) جووت؛ دوان.
(٤) دوو زار کە وەك یەك بهێنن (وەك دوو پێنج یا دوو شەش... هتد).
(٥) دوو ووشەی هەمان سەرچاوەی شێوە جیاواز (زمانەوانی).
(وەك: hospital و hostel)

**double take,** وەلام دانەوە یا هەست دەربرینێکی دواکەوتوو بۆ نوکتەیەك یا ڕووداوێك

**double talk,** (١) دووانی فروفێلاوی؛ ووتەی دووڕوو کە مەبەستی خەڵەتاندن بێت؛ دووڕوویی؛ دووزمانی. (٢) ووتەی هیچوپووچ و بێ مانا

**double-think** (dub′'l-thiŋk′), *n.* بڕواکردن بە دوو بیروڕای ناکۆك لە هەمان کاتدا

**double time,** (١) مووچەی دوو قات (بۆ کارکردنی زیاتر لە کاتی ئاسایی). (٢) ڕۆیشتنێکی خێرا (سوپا).

**double-tongued** (dub′'l-tuŋd′), *adj.* دووڕوو؛ دووزمان

**doubly** (dub′li), *adv.* (١) دوو ئەوەندە؛ دوو قات؛ زۆر: *(to be ~ careful)*
(٢) دوان بەیەکەوە؛ دوانە
(٣) [Archaic]، بە دووڕوویی.

**doubt** (dout), *v.i. & v.t.* گومان هەبوون؛ گومان لێکردن؛ دوودڵ بوون لە شتێك
*n.* گومان؛ دوودڵی
beyond doubt, بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە.
in doubt, گومانی تێدایە؛ نامسۆگەر.
no doubt, (١) بێ گومان؛ مسۆگەر. (٢) زۆر بۆی هەیە؛ زۆر لەوانەیە
without doubt, بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە

**doubtful** (dout′fəl), *adj.* (١) گومانی تێدایە؛ نامسۆگەر؛ دووبەختی
(٢) گومانی لێ دەکرێت؛ جێی گومانە. (٣) گوماندار؛ بەگومان؛ دووشك.

**doubting Thomas,** تۆماسی گوماندار: یەکێك بوو لە قوتابییەکانی عیسا کە گومانی لە زیندووبوونەوەی عیسا هەبوو؛ کەسێکی بەگومان لە هەمووشتێك

**doubtless** (dout′lis), *adj.* (١) بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە؛ دیارە.
(٢) زۆر لەوانەیە

**douche** (dōōsh), *n.* (١) دووش؛ ئاوپرژێنی گەرماو.
(٢) دووش وەرگرتن؛ خۆشتن بە ئاوپرژێنی گەرماو
*v.t. & v.i.* دووش وەرگرتن؛ خۆشتن بە ئاوپرژێنی گەرماو.

**dough** (dō), *n.* (١) هەویر. (٢) [Slang]، پارە؛ دراو

**doughnut** (dō′nut′), *n.* ئەڵقەیەك هەویری سوورەوەکراوی شیرینە؛ کێکێکی ئەڵقەیی شیرینە

**doughty** (dou′ti), *adj.* ئازا؛ چاونەترس؛ بەجەرگ.
-doughtily *(adv.)*; doughtiness *(n.)*.

**doughy** (dō′i), *adj.* هەویراوی؛ نەبرژاو؛ شل وەك هەویر.

**dour** (dōōr, door, dour), *adj.* (١) [Scot.]، سەخت؛ بەزەبرووزەنگ؛ توندوتیژ. (٢) [Scot.]، کەللەرەق. (٣) مڕومۆن؛ بەرچاوتاریك.

**douse** (dous), *v.t.* (١) بە توندی لێدان؛ پیاکێشان
(٢) داگرتنی بایەوانی بەلەمی بایەوان بەپەلە.
(٣) [Colloq.]، داکەندن (پێڵاو، جلوبەرگ).
(٤) [Colloq.]، بەپەلە کوژاندنەوە (ئاگر، چرا، گڵۆپ).

**douse** (dous), *v.t.* (١) بەپەلە خستنەناو ئاو یا شلەیەکی ترەوە؛ لە ئاو هەڵکێشان. (٢) ئاوپێداکردن؛ تەڕکردن.
*v.i.* نوقم بوون لە ئاودا؛ تەڕبوون.

**dove** (duv), *n.* (١) کۆترەباریکە؛ کۆتر.
(٢) کەسێکی ئاشتیخواز؛ کەسێکی هێمن و ئاسك.

**dove** (dōv), *alternative past tense of* **dive.**

**dovecote** (duv′kōt′, duv′kot′), *n.* هێلانە کۆتر

**dovetail** (duv′tāl′), *n.* (١) دوو ئامێری نێرو مێ کە دەکرێن بەیەکدا.
(٢) جوومگەیەکی وەها پێکهاتوو (ئامێر).
*v.t.* (١) بەیەکداکردن (ئامێر)؛ کردن بەیەکدا.
(٢) لەیەکدان و پێکەوەبەستن (بیروڕا، زانیاری).
*v.i.* بەیەکداچوون (ئامێر)؛ لەیەکدان

**dowager** (dou′ə-jẽr), *n.* (١) بێوەژنێکی بەگزادە.
(٢) [Colloq.]، پیرەژنێکی سامانداری بەشکۆ

**dowdy** (dou′di), *adj.* پنتی؛ جلوبەرگ پیس وپۆخڵ و ناشرین.
*n.* ژنێکی پنتی؛ ژنێکی جلوبەرگ پیس وپۆخڵ و ناشرین.
-dowdily *(adv.)*; dowdiness *(n.)*.

**dowel** (dou′əl), *n.* (١) دوگمە.
(٢) سنگ (بە دیوارەوە بۆ شت هەڵواسین).
*v.t.* پێکەوەبەستن بە دوگمە.

**dower** (dou′ẽr), *n.* (١) مارەیی.
(٢) بەشی بێوەژنێك لە میراتی مێردەکەی.
(٣) لێهاتوویی؛ توانای زگماکی یا سرووشت کردە

**dowery** (dou′ẽr-i), *n.* = **dowry.**

**down** (doun), *adv.* (١) بۆ خوارەوە؛ بەرەوخوار.
(٢) لە خوارەوە؛ خوارەوە؛ لەسەر زەمین؛ ژێر؛ لەبنەوە.
(٣) ناو؛ ناوەوە: (downtown).
(٤) لە (کات، مێژوو، یا کەسێکی کۆنەوە): *(~ from the Middle Ages)*
(٥) پەست؛ غەمگین.
(٦) نەخۆشی گرتن؛ نەخۆش کەوتن: *(He came ~ with pneumonia.)*
(٧) ڕێ لێگرتن؛ گرتن: *(They held him ~.)*
(٨) هاتنەخوارەوە؛ داشکان؛ کەمبوونەوە: *(Things have come ~ in price.)*
(٩) توندبوونەوە (بە کوڵاندن): *(Boil ~ the vegetables.)*
(١٠) کپ؛ هێمن؛ خامۆش: *(The waves settled ~.)*
(١١) بە دڵ؛ بە ڕاستی: *(Get ~ to work.)*
(١٢) بەتەواوی (پڕ): *(The car is loaded ~.)*
(١٣) پێشەکی (دراو): *(five dollars ~ and the remainder in installments)*
(١٤) بە نووسین؛ نووسین؛ تۆمارکردن: *(Take ~ his name.)*
*adj.* (١) بەرەوخوار؛ بۆ خوارەوە. (٢) لە خوارەوە؛ لەسەر زەوی.
(٣) هێنراوە خوارەوە؛ هاتووە خوارەوە. (٤) پێشەکی دراو.
(٥) پەست؛ غەمگین؛ مەلوول؛ بارکەوتوو. (٦) نەخۆش؛ کەوتوو.
(٧) (ا) یاری پێ ناکرێت (تۆپ)؛ یاری پێ نەکراو.
(ب) لە دواوە (تیپی یاری)؛ دۆڕاو.
*prep.* بەرەوخوار.
*v.t.* (١) خستنەخوارەوە (فڕۆکە). (٢) دان بە زەویدا.
(٣) هێنانەخوارەوە؛ ڕاکێشانە خوارەوە.
(٤) [Colloq.]، بە پەلە خواردنەوە؛ هەڵ لووشین:
*(He ~ed a beer in two minutes.)*
*v.i.* کەوتنەخوارەوە؛ هاتنەخوارەوە.
*n.* (١) بەرەوخوارکە.
(٢) نەهاتی؛ بەدبەختی؛ نەگبەتی: *(the ups and ~s of a career)*
come down on a person, سەرزەنشت کردن؛ هێرش بردنە سەر؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن.
down and out, (١) دراو بە زەویدا (بۆکسبازی).
(٢) بێ دەرامەت؛ فەوتاو؛ هەژار.
down to earth, خاکی؛ سادە؛ بێ فیز.
down with, بڕوخێ! (دوژمن، فەرمانڕەوایی، شتی ناپەسەند).
get (come) down to business, بە دڵ خەریك بوون؛ بە ڕاستی هەوڵدان؛ کات بەفیڕۆنەدان.
let a person down, نائومێدکردن؛ خواستی کەسێك نەهێنانەدی.
pay down, بە پارەی ڕەق کڕین نەك بە قەرز.
put a person down, شکاندن (مرۆڤ)؛ سەرزەنشت کردن.

**put one's name down,** ناوی خۆ نووسین له لیستەیەکدا.

**run (hunt) a person (an animal) down,** ڕاوکردن؛ شوێن کەوتن (بۆ دۆزینەوەو گرتن).

**talk down to,** وەك منداڵ لەگەڵ دووان (واتە زۆر بە سادەیی).

**down** (doun), *n.* (١) پەڕی بەچکە باڵندە (کە زۆر نەرمە). (٢) نەرمەتووك؛ گەندەموو.

**down** (doun), *n.* (١) گردێکی گەورەو بەربەرەڵای بە گیا داپۆشراو. (٢) گردۆڵکەی لم (کە با درووستی دەکات).

**downcast** (doun′kast′, doun′käst′), *adj.* (١) بەرەوخوارچوو؛ شۆڕبووەوە. (٢) مەلوول؛ غەمگین؛ پەست؛ ڕووگرژ.

**downfall** (doun′fôl′), *n.* (١) ڕووخان (فەرمانڕەوایی، دەسەلاتدار)؛ نشوستی هێنان؛ فەوتان؛ کەوتن؛ ڕمان. (٢) باران یا بەفر بارینێکی زۆر.

**downfallen** (doun′fôl′n), *adj.* فەوتاو؛ ڕووخاو؛ شکست هێناو.

**downgrade** (doun′grād′), *n.* بەرەوخوارکەیەك (ڕێگە).

*adv. & adj.* بەرەوخوارکە

*v.t.* لە پلە نزم کردنەوە؛ پلە شکاندن؛ لە بایەخ کەمکردنەوە.

**downhearted** (doun′här′tid′), *adj.* غەمبار؛ پەست؛ مەلوول.

**downhill** (doun′hil′), *adv.* بەرەوخوارکە (گرد)؛ سەربەرەوخوار؛ بەرەوخوار

*adj.* لێژ؛ سەربەرەوخوارکە.

**go downhill,** بەرەو نەمان یا فەوتان چوون؛ بەناخداچوون؛ دانەدواوە (تەندرووستی، سامان)

**downpour** (doun′pôr′, doun′pōr′), *n.* ڕەهێڵە؛ لێزمە باران؛ تاوە باران

**downright** (doun′rīt′), *adv.* (١) بەتەواوی؛ تەواو. (٢) [Rare]، یەکسەر بۆ خوارەوە. (٣) [Archaic]، بە ئاشکرا.

*adj.* (١) تەواو؛ بێ پێچ‌وپەنا: *(a ~ lie)*. (٢) قسەلەڕوو: هیچ نەشارەوە؛ لەڕوو دانەماو: *(a ~ fellow)*. (٣) [Rare]، یەکسەر بۆ خوارەوە.

**Down's syndrome,** *Also* **Down syndrome.** نەخۆشی‌یەکی زگماکی‌یە بریتی‌یە لە چاو چەپ‌وڕاستی‌و بێ مێشکی. (هەروەها "مەنگۆلی" یشی پێ دەووترێ).

**downstairs** (doun′stârz′), *adv.* (١) بۆ خوارەوە بە پێ‌پلیکانەکاندا؛ بۆ ژێرخان (٢) لە ژێرخان؛ لە نهۆمی خوارەوە یا خوارتر؛ لەخوارەوە.

*adj.* لەخوارەوە؛ لە ژێرخان.

*n.* ژێرخان؛ نهۆمێکی خوارەوە یا خوارتر.

**downstream** (doun′strēm′), *adj. & adv.* بەرەوخوار بە-ڕووبارێکدا؛ بە هەمان ڕێبازی ڕووبار یا جۆگەیەکدا.

**downtown** (doun′toun′), *adj.* (١) لە لاخوارووی شار. (٢) لە ناوشار؛ لە ناوبازاڕ؛ هی ناوشار.

*adv.* بەرەو لاخوارووی شار؛ بەرەو ناوشار؛ لە ناوبازاڕ.

*n.* ناوشار؛ ناوبازاڕ.

**downtrodden** (doun′trod′n), *adj.* (١) پێ پەست کراو؛ پێشێل کراو (٢) چەوسێنراوە؛ زۆرلێکراو؛ ماف خوراو.

**downward** (doun′wẽrd), *adv. & adj.* (١) بەرەوخوار؛ بەرەوژێر؛ سەربەرەوخوار (٢) لە کاتێکی کۆنەوە بۆ کاتێکی تازەتر.

**downwards** (doun′wẽrdz), *adv.* = **downward.**

**dowry** (dou′ri), *n.* (١) مارەیی؛ جیازی؛ ئەو سامانەی بووك لەگەڵ خۆی دەیهێنێت بۆ زاوا. (٢) بەهرە؛ لێهاتوویی زگماکی: *( Poetry was his ~ .)*. (٣) [Archaic]، میراتی بێوەژن.

**dowse** (dous), *v.t.* تەڕکردن؛ لە ئاو هەڵکێشان.

**dowse** (douz), *v.i.* بۆ ئاو یا کانزا گەڕان لەژێر زەویدا بە دارێکی دووفلیقانەی خەمڵ پێ لێدەر

**dowsing rod,** = **divining rod.**

**doxy** (dok′si), *n.* بیروباوەڕی ئاینی؛ ڕێباز: **(orthodoxy)**.

**doxy** (dok′si), *n.* [Slang], ئافرەتێکی سووك.

**doze** (dōz), *v.i.* وەنەوزەکوتێ هاتن؛ خەوبردنەوە؛ سەرخەو شکاندن.

*v.t.* کات بردنەسەر یا کوشتن بە وەنەوزەکوتێ.

*n.* سەرخەو؛ خەوەنووچکە.

**doze off,** سەرخەو شکاندن؛ خەوبردنەوە.

**dozen** (duz′′n), *n.* دەرزەن؛ دوانزە؛ دەستە.

**dozenth** (duz′′nth), *adj.* دوانزەمین.

**Dr.,** **Doctor.**

**drab** (drab), *n.* (١) قوماشێکی بۆر یا دێز. (٢) ڕەنگێکی بۆر یا دێز.

*adj.* (١) بۆر؛ دێز. (٢) ووشك؛ ناخۆش؛ یەك نەوا: *( a ~ existence)*.

**drab** (drab), *n.* (١) ژنێکی چەپەڵ. (٢) قەحبە؛ ئافرەتێکی سووك.

**drabble** (drab′′l), *v.t.* قوڕاوی کردن بە ڕاکێشان بەناو قوڕاودا.

*v.i.* قوڕاوی بوون.

**drachma** (drak′mə), *n.* (١) دراخما: (ا) دراوێکی زیوی یۆنانی کۆنە. (ب) یەکەی دراوی یۆنانی تازە (٢) کێشەیەکە.

**draft** (draft, dräft), *n.* *Also* **draught,** (١) ڕاکێشان (بار، هۆی گواستنەوە). (٢) باری ڕاکێشراو؛ ئەو شتەی ڕادەکێشرێت یا قەبارەکەی (٣) ڕاکێشانە دەرەوەی تۆڕی ماسی لە ئاودا (٤) ماسی گیراو لە ڕاکێشانێکی تۆڕی ماسیدا. (٥) خواردنەوە. (٦) قوم؛ مژ (شلە). (٧) خواردنەوەیەك. (٨) هەڵمژین (هەوا، دووکەڵی جگەرە). (٩) هەوا یا دووکەڵی هەڵمژێنراو. (١٠) تێکردنی بیرە لە بەرمیلەوە (کاتی داواکردنی لە باڕدا). (١١) ڕەشنووس؛ گەڵاڵەنووس. (١٢) نەخشە (کار)؛ گەڵاڵە. (١٣) تەووژمی با. (١٤) ئامێری ڕێك‌وپێك کردنی تەووژمی با. (١٥) کومپیالە؛ چەك. (١٦) سەربازگری؛ سەربازگرتن. (١٧) ئەوانەی بانگ دەکرێن بۆ سەربازی یا بە سەرباز دەگیرێن. (١٨) [Slang]، دەسەڵات. (١٩) داشکاندنێك لە کێشی کەل‌وپەل لەبەر کەم هێنانی (بازرگانی). (٢٠) قەبارەی کونی بۆری‌یەکی ئاو. (٢١) قووڵایی ئەو ئاوەی کەشتی‌یەك لای دەبات

*v.t.* (١) گرتن بە سەرباز؛ بانگ کردن بۆ سەربازی. (٢) دەرهێنان؛ ڕاکێشان. (٣) نەخشەکێشان؛ گەڵاڵەکردن.

*adj.* (١) هی بار؛ بۆ بار ڕاکێشان بەکاردەهێنرێت: *( ~ animals)*. (٢) لە بەرمیلێکەوە بە ترومپا تێ دەکرێت بەپێی داخوازی: *( ~ beer)*

**on draft,** ئامادەیە لە بەرمیلەوە تێ بکرێت بە ترومپا (بیرە).

**draft animal,** ووڵاخی بار.

**draft board,** لیژنەی سەربازگری.

**draft dodger,** خۆدزەرەوە لە سەربازگری؛ خۆشارەوە یا یاخی بوو لە گیران بە سەربازی.

**draftee** (draf-tē′, dräf-tē′), *n.* کەسێکی بە سەرباز گیراو.

**drafts** (drafts, dräfts), *n.pl.* *Also* **draughts,** یاری دامە.

**draftsman** (drafts′mən, dräfts′mən), *n.* (١) نەخشەکێش. (٢) داڕێژەری بڕوانامەی یاسایی.

**drafty** (draf′ti, dräf′ti), *adj.* تەووژمی بای لێوە دێتە ژوورەوە؛ لەسەر ڕێی تەووژمی بادایە.

-**draftily** *(adv.)*; **draftiness** *(n.)*.

**drag** (drag), *v.t.* (١) ڕاکێشان (بەسەر زەوی، زەمینە، یا ڕێگەدا)؛ بەکێش کردن. (٢) جۆماڵ کردن؛ ڕاکێشانی قولاپ یا تۆڕ بە بنی دەریاچە، ڕووبار، یا جۆگەیەکدا بۆ پاکردنەوەی یا شت گرتن‌و دەرهێنان. (٣) ماڵەکردنی زەوی‌وزار (٤) درێژەپێدان (ئەرك، کار، دووان). (٥) هێنانەوەکایەی باسێك لە گفتوگۆ یا ووتارێکدا بەزۆرو بەبێ ئەوەی هیچ پێویست بێت.

*v.i.* (١) ڕاکێشران؛ بە کێش کران (٢) دواکەوتن؛ بەجێمان. (٣) درێژەکێشان؛ زۆر خایاندن.

(٤) جۆمان کردن؛ بنی جۆگە، ڕووبار، یا دەریاچە گەڕان بە قولاپ یا تۆڕ.

*n.* (١) شتێکی بەسەر زەویدا ڕاکێشراو. بەتایبەتی: (ا) ماڵە.
(ب) گالیسکەی بەفرینی گەورە. (ج) گالیسکەیەکی گەورە.
(٢) قولاپ (بۆ هێنانەدەرەوەی شتێك لە بنی ڕووبار، جۆگە، یا دەریاچەدا).
(٣) ئیستۆپی ئوتومبیل. (٤) کۆسپ.
(٥) جووڵانەوەیەکی سست و درێژخایەن؛ شتێکی ناخۆش و درێژخایەن.
(٦) باری قورس ڕاکێش (ئامێر). (٧) [Slang]، دەسەڵات؛ کارتێکردن.
(٨) [Slang]، مژ (جگەرە، سەبیل). (٩) [Slang]، سەما.
(١٠) [Slang]، پێشبڕکێیەکە لەنێوان هەندێ ئوتومبیلدا.
(١١) بەرهەڵستی با بۆ فڕینی فڕۆکە.
(١٢) (ا) پاشماوەی بۆنی گیاندارێك (ڕاوکردن).
(ب) ڕاکێشانی شتێك بە ناوچەی ڕاوکردندا بۆ بەجێهێشتنی پاشماوەی ئەو بۆنە.
(ج) ڕاوکردن لەم شوێنەدا.

**drag into,** تێوەگلاندن؛ پێوەکردن (تەنگ و چەڵەمە)؛ تووش کردن.

**drag on (or out),** درێژەپێدان بە شتێکی ناخۆش؛ درێژەکێشان؛ وەڕس کردن

**[ The war (suffering, lecture, waiting) dragged on. ]**

**drag one's feet,** خستن بە قنگدا؛ سستی نواندن لە کردنی کارێکدا.

**dragnet** (drag′net′), *n.* (١) تۆڕێك کە بە بنی ڕووبار یا دەریاچەیەدا ڕادەکێشرێت بۆ ماسی گرتن (٢) دەزگای گرتنی تاوانباران

**dragon** (drag′ən), *n.* (١) ئەژدیها (ئەفسانە)؛ شامار
(٢) چاودێرێکی بەزەبر. (٣) (ا) جۆرە تفەنگێکی کورتی کۆنباوە.
(ب) هەڵگری ئەم جۆرە چەکە؛ سەربازێك کە ئەم جۆرە چەکەی پێ بێت.
(٤) [Archaic]، مارێکی گەورە. (٥) [D-]، کۆنەستێرەیەکە.
(٦) جۆرە ڕووەکێکە (٧) جۆرە مارمێلکەیەکی ئاسیایی بچووکە کە دەخشێت وەك بفڕێت وەهایە

**dragonet** (drag′ən-it), *n.* (١) ئەژدیهایەکی بچووك
(٢) جۆرە ماسییەکی دەریایی بچووکی ڕەنگاوڕەنگە.

**dragonfly** (drag′ən-flī′), *n.* پەپوولە قنگ بارێکە؛ پووشکە بە قنگە.

**dragoon** (drə-gōōn′), *n.* (١) سەربازی سوارە بە تفەنگێکی کورتی کۆنباوەوە (٢) سوارەی پڕچەك.

*v.t.* هەراسان کردن و چەوساندنەوە بە سەربازی تفەنگ لە شان؛ زۆرلێکردن.

**drain** (drān), *v.t.* (١) ئاوەچۆڕکردن؛ چۆڕاندنەوە؛ هەڵچۆڕاندن.
(٢) چۆڕاندنەوە؛ ووشك کردن: *( The doctor ~ed the abscess.)* .
(٣) خواردنەوە؛ هەڵقوڕاندن؛ هەڵچۆڕاندن (پەرداخ، کوپ، پیاڵە).
(٤) بەکارهێنان و هیچ تێدا نەهێشتن (سامان، ووزە، هێز). (٥) پاڵاوتن.

*v.i.* (١) چۆڕانەوە؛ ووشکبوونەوە
(٢) تێڕژان (ئاو) *( Central Europe ~s into the Danube.)* .

*n.* (١) زێراب؛ ئاوەڕۆ؛ گۆڕیچە؛ بۆری زێراب.
(٢) بەکارهێنان و هیچ نەهێشتن (سامان، ووزە، هێز).
(٣) لوولەی شلە لە لەش دەرهێنان (نەشتەرکاری).

**go down the drain,** بەفیڕۆچوون؛ بەناخداچوون

**drainage** (drān′ij), *n.* (١) ئاوەچۆڕکردن؛ هەڵچۆڕاندن؛ چۆڕاندنەوە؛ ووشك کردنەوە. (٢) زێراب؛ ئاوەڕۆ؛ گۆڕیچە؛ بۆری زێراب.
(٣) چێپاو؛ چڵکاو؛ پیساوی زێراب؛ ئاوێك لە شتێك چۆڕابێتەوە.
(٤) ناوچەیەك کە ئاوەکەی هەموو بڕژێتە ڕووبارێکەوە.

**drainer** (drān′ẽr), *n.* (١) ئاوەڕۆ دروستکەر؛ دانەری بۆری زێراب
(٢) دەفر یا لوولەی ئاو و شلە لێ دەرهێنان.

**drainpipe** (drān′pīp′), *n.* بۆری گەورەی ئاو یا زێراب.

**drake** (drāk), *n.* نێرە مراوی.

**drake** (drāk), *n.* (١) تۆپێکی جەنگی بچووکی کۆنباوە.
(٢) جۆرە جانەوەرێکە بۆ دانی ڕاوەماسی بەکاردەهێنرێت.
(٣) [Archaic]، ئەژدیها (ئەفسانە).

**dram** (dram), *n.* (١) کێشێکی زۆر بچووك.
(٢) پێکێکی بچووکە لە خواردنەوەی سەرخۆشکەر.

(٣) بڕێکی کەم (لە هەرشتێك).

**drama** (drä′mə, dram′ə), *n.* (١) دراما؛ چیرۆکی شانۆگەری؛ وێژەی شانۆگەری. (٢) شانۆنامە؛ شانۆگەری.
(٣) ڕووداوێکی سەرنج ڕاکێش و بەجۆش

**dramatic** (drə-mat′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە شانۆگەری؛ شانۆیی؛ تایبەتی بە نواندن. (٢) بەجۆش (ڕووداو، مرۆڤ)؛ لەپڕو سەرنج ڕاکێش (ڕووداو)؛ هێنەرەجۆش.

**-dramatical** *(adj.)*; **dramatically** *(adv.)*.

**dramatics** (drə-mat′iks), *n.pl.* (١) هونەری شانۆگەری؛ هونەری شانۆنامە نواندن. (٢) شانۆگەری نەوکاران.

**dramatis personae,** کەسانی شانۆنامە.

**dramatist** (dram′ə-tist), *n.* شانۆنامەنووس؛ شانۆگەر.

**dramatize** (dram′ə-tīz′), *v.t.* (١) وەك شانۆگەری لێکردن؛ پیشاندان لەسەر شانۆ. (٢) پیشاندان، نواندن، یا گێڕانەوە بەشێوەیەکی پڕ جۆش و سەرنج ڕاکێش.

**-dramatization** *(n.)*.

**dramaturge** (dram′ə-tûrj′), *n.* = **dramatist.**

**dramaturgy** (dram′ə-tûr′ji), *n.* هونەری نووسین و نواندنی شانۆگەری.

**-dramaturgic** *(adj.)*; **dramaturgically** *(adv.)*;
**dramaturgist** *(n.)*.

**drank** (draŋk), *past tense of* **drink.**

**drape** (drāp), *v.t.* (١) داپۆشین و ڕازاندنەوە بە قوماش یا جلی لۆچ-لۆچاوی. (٢) لۆچ لۆچ کردن (قوماش، جل و بەرگ)

*v.i.* لۆچ لۆچ وەستان (جل و بەرگ، قوماش، پەردە).

*n.* (١) *(pl.)*، پەردەی پەنجەرە (هی لۆچ لۆچاوی).
(٢) چۆنێتی وەستانی جل و بەرگ لەبەردا.

**draper** (drāp′ẽr), *n.* (١) کووتاڵ دروستکەر.
(٢) بازرگانی کووتاڵ و ووشکە خواردەمەنی؛ کووتاڵ فرۆش.

**drapery** (drā′pẽr-i), *n.* (١) کووتاڵ؛ قوماش؛ تەنراو
(٢) کووتاڵ و ووشکە خواردەمەنی فرۆشی.
(٣) جل یا قوماشی لۆچ لۆچ وەستاو.
(٤) ڕێکخستنی جل یا قوماش بە لۆچ لۆچی و هونەرییانە لە نیگارو پەیکەردا.
(٥) *(pl.)*، پەردەی پەنجەرە

**drastic** (dras′tik), *adj.* لە ئەندازە بەدەر؛ توندوتیژ؛ نائاسا؛ بنچینەیی؛ سەخت: *( ~ changes; ~ measures to stop crime)*

**drastically** (dras′ti-k′l-i, dras′tik-li), *adv.* ئێجگار؛ زۆر؛ بە شێوەیەکی بنچینەیی *( The two plans are ~ different.)*

**draught** (draft, dräft), *n., v.t., & adj.* = draft.

**draughts** (drafts, dräfts), *n.pl. Also* **drafts,** [British]، دامە.

**draughtsman** (drafts′mən, dräfts′mən), *n.* (١) نەخشەکێش؛ دارێژەری بڕوانامەی یاسایی (٢) [British]، داشی دامە.

**draw** (drô), *v.t.* (١) ڕاکێشان: *( A horse ~s the cart.)* .
(٢) (ا) کردنەوە (پەردەی پەنجەرە یا شانۆ).
(ب) ڕاکێشان (تۆڕی ماسی گرتن یا قولاپی بنی ڕووبارو دەریاچە پاکردنەوە).
(ج) بەرزکردنەوە (بایەوانی کەشتی بایەوانی)
(٣) هێنانەوەیەکی کەوان بۆ تیرهاویشتن. (٤) لابردنی ئاو لەلایەن کەشتییەوە
(٥) ڕاکێشان (سەرنج): *( to ~ attention to oneself)* .
(٦) هەڵکێشان (هەناسە)؛ وەرگرتن (هەناسە).
(٧) پەیداکردن؛ هێنان.
(٨) بوون بە هۆ؛ بۆ هاتن *( The airplane drew the enemy's fire.)* .
(٩) دەرهێنان (ددان، خەنجەر، شیر): *( to ~ a sword)* .
(١٠) هەڵمژین؛ لێ دەرهێنان (شلە)؛ چۆڕاندنەوە.
(١١) ئاو ڕاکێشان بۆ شوێنێك؛ ئاوهێنان؛ ئاوهەڵهێنجان (لە بیر)
(١٢) ڕیخۆڵە دەرهێنان

(١٣) (أ) پارە لە بانق دەرهێنان. (ب) چەك یا حەواڵە نووسین.
(١٤) وەرگرتن؛ دەسکەوتن: *( He ~s a good salary.)* .
(١٥) بۆ دەرکەوتن؛ ئەنجام بۆ دەرکەوتن.
(١٦) بردنەوە (هایبەخت، پیانقۆ).
(١٧) ڕاکێشان (کاغەزی یاری یا قومار).
(١٨) ڕاکێشان (پەت، گوریس)؛ کشاندن: *( They drew the rope tight.)* .
(١٩) شێوە تێکدان؛ شێواندن. (٢٠) گەڵاڵەکردن (کانزا).
(٢١) شیش دروستکردن (بە ڕاکێشانی ئاسن بە کوندا).
(٢٢) (أ) وێنەکێشان؛ وێنەکردن؛ نیگارکێشان: *( to ~ a picture)* .
(ب) نەخشەکێشان؛ داڕشتن (پلان، نەخشە).
(٢٣) ڕوونکردنەوە؛ باسکردن
(٢٤) جیاوازی پیشاندان یا دەرخستن:
*( to ~ a distinction between two things)*

*v.i.* (١) ڕاکێشان.
(٢) هاتن بەرەو؛ نزیکبوونەوە لە: *( We drew near to town.)* .
(٣) چوونەوەیەك؛ کرژبوون؛ تورت بوون.
(٤) ڕاکێشان (دووکەڵ، هەوا): *( The chimney ~s well.)* .
(٥) شوێن کەوتن (ڕاو).
(٦) یەکسان بوون (پێشبڕکێ): *( The two teams drew.)* .

*n.* (١) ڕاکێشان (٢) شتێکی ڕاکێشراو (کاغەزی یاری، قومار، هایبەخت).
(٣) یەکسانی (پێشبڕکێ): *( The game ended in a ~ .)* .
(٤) شتێکی سەرنج ڕاکێش یا بەباو.
(٥) ئەو بەشەی پردی بزوێن کە دەجووڵێت، واتە بەرزدەبێتەوە تا کەشتی تێپەڕ دەبێت بە بنیداو دوایی نزم دەبێتەوە بۆ جێی خۆی.
(٦) چالاییەك کە ئاوی دەرروپشتەکەی بۆ دێت.

**beat to the draw,** (١) دەستپێشکەری کردن لە چەك لێ دەرهێناندا.
(٢) دەستپێشکەری کردن لە بەرامبەر کارێکدا.

**draw a blank,** بۆش هێنان؛ ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن.

**draw a distinction between,** جیاوازی پیشاندان یا خستنە بەرچاو.

**draw a parallel (between),** لەیەکچوواندن؛ هاوشێوەیی یا هاوجۆری پیشاندان

**draw back,** کشانەوە؛ خۆکشانە دواوە

**draw blood,** بریندارکردن؛ خوێن لێ هێنان؛ توورەکردن.

**draw down the curtain,** (١) پەردە داخستن (شانۆ)؛ دوایی پێ هێنان.
(٢) بڕینەوە (باس، دووان).

**draw first blood,** دەستپێشکەری کردن لە هێرش بردنەسەردا؛ یەکەم هێرش بردنەسەر.

**draw on (upon) something,** پەنا بۆ بردن؛ پشت پێ بەستن؛ لێ سەندن (یارمەتی)؛ لێوەرگرتن (هێز، زانیاری، یارمەتی).

**draw one's last breath,** دوا هەناسە هەڵکێشان؛ مردن.

**draw (a person) out,** دان بۆ ڕۆکردن بۆ قسە لێ دەرهێنان؛ هاندان بۆ لێ دەرهێنان (نهێنی، ووتە).

**draw (something) out,** درێژەپێدان (کار، دووان)

**draw the line,** سنوور بۆ دانان

**draw the teeth,** ددان دەرهێنان؛ لە زیان بەخشین خستن؛ پەکخستن

**draw the winner,** بردنەوە؛ سەرکەوتن؛ بلیتی براوە بۆهاتن (هایبەخت، پێشبڕکێی ئەسپ).

**draw together,** نزیکبوونەوە لەیەکتری.

**draw up,** نەخشەکێشان؛ داڕشتن (نەخشە، پلان)؛ نووسین (بڕوانامە).

**drawback** (drô′bak′), *n.* (١) پارەی بۆ گەڕێنراوە (بەتایبەتی باجی گومرگ لەسەر شتومەکی هێنراو بۆ وولات کە لەدواییدا دەنێررێتەوە دەرەوە).
(٢) کەموکووری؛ ناتەواوی؛ ڕووی خراپی؛ خراپە.

**drawbridge** (drō′brij′), *n.* پردی بزوێن پردێکە کە دەتوانرێت بەرزو نزم بکرێتەوەو ڕابکێشرێت بەلادا بۆ تێپەڕبوونی کەشتی یا قەدەغەکردنی ڕەت بوون

**drawee** (drô′ē′), *n.* کەسێکی کومپیالە یا حەواڵە لەسەر نووسراو.

**drawer** (drô′ẽr), *n.* (١) نیگارکێش؛ وێنەکێش.
(٢) خواردنەوەتێکەر (لە بارِدا)؛ بەردەستی بار.
(٣) کومپیالە، حەواڵە یا چەك بۆ نووسراو، واتە وەرگر.
(٤) نەخشەکێش؛ نەخشەکەر. (٥) چەکمەج.
(٦) (*pl.*)، دەرپێ؛ دەرپێی درێژ.

**drawing** (drô′iŋ), *n.* (١) ڕاکێشان. (٢) نیگارکێشان؛ وێنەکردن.
(٣) وێنە؛ نیگار (بە پێنووس نەك بە فلچە).
(٤) هایبەخت؛ پیانقۆ؛ ڕاکێشان (هایبەخت).

**drawing board,** تەختەی وێنە لەسەر کردن.

**drawing room,** (١) دیوەخان؛ ژووری میوان؛ ژووری پێشوازی کردن.
(٢) میوانی ژووری میوان. (٣) ئاهەنگی پێشوازی.
(٤) ژوورێکی تایبەتی لە شەمەندەفەردا.

**drawknife** (drô′nīf′), *n.* چەقۆی دوودەسکی: چەقۆیەکە داری پێ دەتاشرێت بە ڕاکێشانی بۆ لای کەسەکە خۆی.

**drawl** (drôl), *v.t. & v.i.* بە هێواشی دووان و درێژکردنەوەی بڕگەکانی ووشە.

*n.* بە هێواشی دووان و درێژکردنەوەی بڕگەکانی ووشە:
*( He speaks with a Southern ~ .)*

**drawn** (drôn), *past participle of* **draw.**

*adj.* (١) ڕووت (خەنجەر، شیر)؛ لە کیف دەرهێنراو یا ڕاکێشراو.
(٢) یەکسان (پێشبڕکێ). (٣) ڕیخۆڵە دەرهێنراو. (٤) لاواز.

**drawstring** (drô′striŋ′), *n.* بەنەخوێن؛ پەتێك کە وەك بەنەخوێن شتی پێ دابخرێت و بکرێتەوە.

**dray** (drā), *n.* عەرەبانەی دەستی پتەو بۆ گواستنەوەی شتی قورس.

**dread** (dred), *v.t. & v.i.* زۆر ترسان؛ زۆر مەترسی لێکردن.

*n.* (١) ترسێکی زۆر؛ مەترسییەکی زۆر؛ لێ ترسانێکی زۆر.
(٢) لێ ترسان و ڕێزێکی زۆر؛ سام.

*adj.* (١) سامدار؛ خراپ. (٢) بەشکۆ.

**dreadful** (dred′fəl), *adj.* (١) سامدار؛ بەسام؛ ترس لێ نیشتن.
(٢) [Colloq.]، زۆر خراپ؛ زۆر ناشرین؛ زۆر ناخۆش.

**-dreadfully** *(adv.).*

**dream** (drēm), *n.* (١) خەو؛ خەون. (٢) ژەخەو؛ داڵفە؛ خەیاڵ خەو.
(٣) ئاوات؛ هیوا؛ ئومێد.
(٤) شتێکی وەك خەو لە جوانی و خۆشی و کورتیدا.

*v.i.* (١) خەوبینین. (٢) داڵفەلێدان؛ ژەخەو بینین.
(٣) ( **of ~** )، واهاتنە بەرچاو.

*v.t.* (١) خەو پێوە بینین؛ خەوبینین.
(٢) ( **~ away; ~ out** )، داڵفەلێدان؛ بە ژەخەو کات بردنەسەر.
(٣) وادانان؛ واهاتنە بەرچاو؛ وا ئومێد کردن.

**dream up, [Colloq.],** بە خەیاڵ هێنانە بەرچاو یا دروستکردن.

**dreamer** (drēm′ẽr), *n.* (١) خەوبین.
(٢) خەیاڵ پڵاو؛ خەیاڵ پەرست؛ داڵفەچی.

**dreamland** (drēm′land′), *n.* (١) شوێنێکی ئەوەندە خۆش و جوان کە هەر بە خەو ببینرێت. (٢) نوستن.

**dreamt** (dremt), *alternative past tense and p.p. of* **dream.**

**dream world,** شوێنێکی ئەوەندە خۆش و جوان کە هەر بە خەو مرۆڤ بتوانێت ببینێت.

**dreamy** (drēm′i), *adj.* (١) پڕ لە خەو.
(٢) خەیاڵ پڵاو؛ ژەخەوپەرست: *( a ~ idealist)* .
(٣) لێڵ؛ ناڕوون وەك خەو.
(٤) خۆش و ناسك: *( a ~ melody)* .

**-dreamily** *(adv.)*; **dreaminess** *(n.).*

**dreary** (drêr′i), *adj.* (١) ووشك و ناخۆش؛ تاریك؛ دڵ پەستکەر؛ ناسوودەنەبەخش؛ پیس و ناخۆش: *( a ~ day; ~ scenery)* .

(۲) [Archaic]. غەمگین؛ دڵتەنگ؛ پەست

-drearily *(adv.)*; dreariness *(n.)*.

**dredge** (drej), ***n.*** (۱) تۆڕێکە بە مەکینەیەك ڕادەکێشرێت بە بنی ڕووبار، دەریاچە، یا کەنداودا بۆ گرتن و کۆکردنەوەی گوێچکەماسی.
(۲) مەکینەی پاکردنەوەو قووڵ کردنی ڕووبارو بەندەر.
***v.t.*** (۱) گوێچکەماسی گرتن و کۆکردنەوە بە تۆڕ
(۲) پاکردنەوە لە قوڕو لم یا قووڵ کردنی ڕووبارو بەندەر بە مەکینەی تایبەتی.
***v.i.*** بەکارهێنانی ئەم جۆرە تۆڕە یا مەکینەیە.

**dredge** (drej), ***v.t.*** (۱) ئارد یا شەکر کردن بە خواردەمەنییەوە
(۲) بێژاندنەوە (ئارد).

**dredger** (drej'ēr), ***n.*** (۱) بەلەمێکی تۆڕدار بۆ گرتنی گوێچکەماسی
(۲) (ا) مەکینەی قوڕو لم دەرهێنان لەبنی دەریاو بەندەردا.
(ب) کەسێك کە بەلەمێك یا مەکینەیەکی وەها کار پێ بکات.

**dredging machine,** مەکینەی پاکردنەوەی ڕووبارو کەنداو لە قوڕو لم

**dregs** (dregz), ***n.pl.*** (۱) خڵتە؛ تلپە.
(۲) بێ نرخ ترین و هیچ‌وپووچ ترین بەشی شتێك: ***( the ~ of society)*** .
(۳) (*sing.*). پاشماوە.

**drench** (drench), ***v.t.*** (۱) خواردنەوە دان بە ووڵاخ (بەتایبەتی دەرمان).
(۲) لە ئاو هەڵکێشان؛ ئێجگار زۆر تەڕکردن.
***n.*** (۱) خۆراکە دەرمانێکی گەورە بۆ ووڵاخێك.
(۲) زۆر تەڕبوون؛ باش تەڕکردن. (۳) شلەی تێهەڵکێش.

**dress** (dres), ***v.t.*** (۱) جل لەبەرکردن؛ پۆشین
(۲) ڕازاندنەوە؛ نەخشاندن. (۳) ڕیزکردن (سەربان).
(٤) برین تیمارکردن؛ برین پێچان یا هەڵپێچان.
(٥) ئامادەکردن (ا) سەربڕین و پاکردنەوە بۆ فرۆشتن (ماسی، مریشك... هتد).
(ب) زەوی‌وزار پاکردنەوە، کێڵان، یا چاندن؛ لق‌وپۆپ کردن و پاکردنەوە (ڕووەك، درەخت). (ج) ڕنەك کردن (ئەسپ)؛ پێستە خۆش کردن.
(د) ساف‌ولووس کردن و بریقە لێ هەڵساندن (بەردی بەنرخ، دار، تەختە).
***v.i.*** (۱) جل لەبەرکردن؛ خۆگۆڕین.
(۲) خۆ ڕازاندنەوە؛ خۆ نەخشاندن (بە لەبەرکردنی باشترین جل‌وبەرگ).
(۳) ڕیزبوون
***n.*** (۱) جل‌وبەرگ (۲) کراسی ژن
(۳) جل‌وبەرگی جوان و کەشخە (بۆ ئاهەنگی ڕەسمی).
(٤) بەرگ؛ ڕووکەش؛ ڕووالەت.
***adj.*** (۱) هی کراس؛ تایبەتی بە کراس: ***( ~ material)*** .
(۲) لە ئاهەنگی ڕەسمیدا لەبەردەکرێت: ***( a ~ suit)*** .

**dress down,** [Colloq.], (۱) سەرزەنشت کردن؛ شکاندن.
(۲) فەلاقەکردن؛ لێدان.

**dress up,** (۱) جلی جوان و کەشخە لەبەرکردن؛ (خۆ) ڕازاندنەوە؛ (خۆ) نەخشاندن. (۲) ڕیزکردن (سەربان).

**dresser** (dres'ēr), ***n.*** (۱) بەردەستێك کە جل دەکاتە بەری کەسێکی تر (بەتایبەتی ئەکتەرێك). (۲) برینپێچ؛ تیمارکەر
(۳) جامخانەی فرۆشگا ڕازێنەرەوە.
(٤) جلی جوان و کەشخە لەبەرکەر: ***( a fancy ~ )*** .

**dresser** (dres'ēr), ***n.*** (۱) مێزی چێشتخانە (کە خواردەمەنی لەسەر ئامادە دەکرێت). (۲) دۆڵابی قاپ‌وقاجاغی چێشتخانە.
(۳) مێزی ئارایشت؛ دۆڵابی ئاوێنەدار.

**dressing** (dres'iŋ), ***n.*** (۱) جل لەبەرکردن (۲) جل‌وبەرگ
(۳) دەرمان و سارغی برین پێچان (٤) پەین.
(٥) ماددەیەکە قوماشی پێ ڕەق دەکرێت لە کاتی درووستکردنیدا.
(٦) سرکەو ڕۆنی زەڵاتە؛ ترش‌وخوێ
(۷) ئاوئاخنی باڵندە بەتایبەتی قەل کە لە فڕندا دەپێشێنرێت.
(۸) [Colloq.]: سەرزەنشت کردن؛ شکاندن.

**dressing-down** (dres'iŋ-doun'), ***n.*** [Colloq.]. (۱) شکاندن؛ سەرزەنشت کردن. (۲) فەلاقەکردن؛ لێدان.

**dressing gown,** ڕۆبی لەبەرکردن.

**dressing room,** ژووری خۆگۆڕین و ئارایشتی ئەکتەران (لەپشت شانۆ).

**dressing table,** مێزی ئارایشت کردن.

**dressmaker** (dres'māk ēr), ***n.*** بەرگدرووی ژنان.

**dress rehearsal,** دوا پەراوەی شانۆگەری یا ئاهەنگێکی ڕەسمی بە جل‌وبەرگی ڕاستەقینەوە (پێش پیشاندانی بۆ خەڵك)

**dress suit,** دەستەجلی ڕێك‌وپێکی ئاهەنگ و بە شەو چوونەدەرەوە.

**dressy** (dres'i), ***adj.*** [Colloq.], (۱) جلی جوان و کەشخە لەبەردەکات؛ خۆڕازێنەرەوە. (۲) جوان و ناسك و ڕێك‌وپێك (جل‌وبەرگ).

**drew** (drōō), *past tense of* **draw.**

**dribble** (drib''l), ***v.i. & v.t.*** (۱) ئاو لێ پرژاندن؛ بە تنۆك تنۆك یا دڵۆپی بچووك هاتنەخوارەوە. (۲) ئاوی دەم تکان؛ ئاو تێزانە ئاو دەم
(۳) تۆپ نزیك کردنەوە لە گۆڵ بە لێدان یا هەڵبەزان و دابەزاندنی بچووك بچووك (یاری تۆپی پێ، باسکە).
***n.*** (۱) تنۆك؛ دڵۆپی بچووك؛ پرژە.
(۲) بەرەبەرە یاری کردن بە تۆپ (بۆ نزیك کردنەوەی لە گۆڵ).
(۳) [Colloq.]، تەپ‌ونم؛ نەرمەباران.

**driblet, dribblet** (drib'lit), ***n.*** بڕێکی زۆر کەم؛ کەم کەم؛ تنۆك؛ دڵۆپ: ***( He pays his debt in ~s .)*** .

**dried** (drīd), *past tense and past participle of* **dry.**

**drier** (drī'ēr), ***n.*** (۱) ووشککەرەوە (مرۆڤ، ئامێر، شت).
(۲) مەکینەی جل ووشك کردنەوە.
(۳) ماددەیەکە دەکرێتە ناو بۆیەوە بۆ ئەوەی زوو ووشك ببێتەوە.

**drift** (drift), ***n.*** (۱) ڕامالّین (بە تەووژمی با یا ئاو). (۲) ڕێباز.
(۳) لادانی پاپۆڕ یا فڕۆکە لەڕێی خۆی (بەهۆی تەووژمی ئاو یا باوە)
(٤) مەیل. (٥) مەبەست؛ مانا: ***( I get your ~ .)*** .
(٦) شتێك کە با یا ئاو ڕای ماڵێت (وەك: بەفر، باران، لم، خۆڵ... هتد).
(۷) کۆمەڵێك بەفر یا لم کە با ڕای ماڵی بێت و کۆی کردبێتەوە.
(۸) بەردو زیخ و لم کە ڕووبار یا ڕووباری سەهۆڵێن ڕای ماڵێت.
(۹) (ا) ئامێری داکوتانی شتێکی قورس. (ب) ئامێری گەورەکردنی کونێك.
(۱۰) کونێکی لابەلا لە کانگەیەکدا. (۱۱) تەووژمێکی دەریایی هێواش
***v.i.*** (۱) ڕامالّین (بە تەووژمی با یا ئاو)؛ ڕامالّران.
(۲) وێڵ بوون؛ ژیان و هەڵسان و دانیشتن بەبێ لێکدانەوە:
***( He doesn't know what he wants to be or do; he is just ~ing through life.)***
(۳) لادان (لە ڕێی خۆ)؛ لادان لە باس.
(٤) کۆمەڵ بوون لە ئەنجامی ڕامالّیندا (بەفر، لم).

**driftage** (drif'tij), ***n.*** (۱) ڕامالّین.
(۲) لادان لە ڕێی خۆ (بەهۆی ڕامالّینەوە بە ئاو یا بە با).
(۳) شتی ڕامالّراو؛ شتی لائاوکەوتوو.

**drifter** (drif'tēr), ***n.*** (۱) (ا) کەسێکی وێڵ؛ کەسێکی بێ ئامانج و بێ مەبەست لە ژیاندا؛ لائاوکەوتوو. (ب) کەسێکی گەڕۆك یا بێ لانە
(۲) بەلەمی ڕاوەماسی (کە تۆڕێکی پێوەیە لەگەڵ شەپۆلی ئاوەکەدا دێت و دەچێت).

**driftwood** (drift'wood'), ***n.*** دارو تەختەی ڕامالّراو (کە لائاو دەکەوێت لە کەناری دەریا یا ڕووباردا).

**drill** (dril), ***n.*** (۱) سمۆ؛ درەوشە؛ ئامێرێکی کارەبایی وەك سمۆیە بۆ دار کونکردن بەکاردێت. (۲) مەشق (سوپا، وەرزش، قوتابخانە)؛ ڕاهێنان.
(۳) شێوازی مەشق یا ڕاهێنان.
***v.t.*** (۱) کون تێکردن (بە سمۆ یا درەوشە).
(۲) مەشق پێکردن (سوپا، وەرزش).
(۳) مەشق پێکردن (خوێندن)؛ ڕاهێنان (بە دووپاتکردنەوەی کار)؛ فێرکردن.
***v.i.*** (۱) کون تێکران (دار). (۲) مەشق کردن (سوپا، وەرزش، خوێندن).

**drill** (dril), ***n.*** (۱) دێراو.
(۲) دێراوێك تۆوی تێژراو.

(٣) مەكینەی دیراو یا چاڵ لە زەویدا درووستكردن‌و تۆو تێداناشتنی.
**v.t.** (١) تۆو چاندن بە دیراو یا بە ریز. (٢) چاندنی كێڵگەیەك بەم شێوەیە.
**drillmaster** (dril′mas′tẽr, dril′mäs′tẽr), ***n.*** (١) مامۆستای مەشق (سوپا)؛ مەشق پێكەر (سوپا). (٢) مامۆستایەكی توندوتیژ كە لەرێی مەشقەوە قوتابی فێردەكات؛ كەسێك كە لەرێی مەشقەوە خەڵك فێری شت دەكات.
**drink** (driŋk), ***v.t.*** (١) خواردنەوە.
(٢) نۆشین؛ بادە نۆشین. (٣) هەڵمژین.
***v.i.*** (١) خواردنەوە. (٢) هەڵمژین.
(٣) خواردنەوەی شەراب‌و شتی سەرخۆشكەر.
(٤) خواردنەوەی شەراب‌و شتی تری سەرخۆشكەر بە زۆری یا خووپێوەگرتنی.
***n.*** (١) خواردنەوە؛ شلەیەك كە بخورێتەوە.
(٢) خواردنەوەی سەرخۆشكەر (شەراب، عەرەق، ویسكی... هتد).
(٣) زۆر خواردنەوە یا خوو بە خواردنەوەوە گرتن.
(٤) پێك (شەراب یا خواردنەوەی تری سەرخۆشكەر).
(٥) [Slang]. زەریا؛ دەریالووش.
**drink in,** بەتاسەوە وەرگرتن بە هەموو هەستەكان‌و مێشك.
**drink to,** بادە نۆشین بە خۆشی كەسێكەوە.
**drinkable** (driŋk′ə-b'l), ***adj.*** بۆ خواردنەوە دەشێت؛ دەخورێتەوە.
***n.pl.*** خواردنەوە.
**drinker** (driŋk′ẽr), ***n.*** (١) كەسێك كە دەخواتەوە.
(٢) عەرەق حۆر؛ كەسێك كە مەی‌و خواردنەوەی تر زۆر دەخواتەوە.
**drip** (drip), ***v.i. & v.t.*** تكان؛ تكەكردن؛ چۆڕەچۆڕكردن؛ تنۆك تنۆك هاتنەخوارەوە.
***n.*** (١) تكان؛ تكە تك هاتنەخوارەوە. (٢) شلەیەك كە بە تنۆك تنۆك بێتەخوارەوە.
(٣) دەنگی دڵۆپێك یا تنۆكێكی كەوتە خوارەوە.
(٤) لێواری پەنجەرەیەك یا سەربانێك كە بارانی لێ دەگێڕێتەوە.
(٥) [Slang]. كەسێكی ووشكی دڵ مردوو.
**drip-dry** (drip′drī′), ***adj.*** ووشك دەبێتەوە بە هەڵخستن‌و ئوتوكردنی ناوێت (جل‌وبەرگ، قوماش).
**drip grind,** قاوەی وورد هاڕاو.
**dripolator** (drip′ə-lā′tẽr), ***n.*** قۆری قاوە.
**dripping** (drip′iŋ), ***adj.*** زۆر تەڕ؛ ئاوی لێ دەتكێت.
***n.*** (١) دڵۆپ دڵۆپ ئاو لێ تكان.
(٢) (*pl.*) جەوری پی‌و شتی تر كە لە گۆشتی برژاو دەتكێت.
**drippy** (drip′i), ***adj.*** (١) باراناوی.
(٢) [Slang]. هەست ناسك؛ دڵ ناسك؛ بەسۆز.
**dript** (dript), *alternative past tense and p.p. of* **drip.**
**drive** (drīv), ***v.t.*** (١) پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە؛ لێخوڕین.
(٢) پاڵ پێوەنان؛ والێكردن: ***( Ambition drove him to crime.)***.
(٣) بەزۆر كارپێكردن (بەتایبەتی لە رادە بەدەر)؛ زۆرلێكردن.
(٤) فڕێدان یا تێهەڵدان بە قایم (تۆپ).
(٥) پێداكردن؛ سمین؛ كونكردن.
(٦) لێخوڕین (ئوتومبیل، گالیسكە)؛ لێخوڕین لەلایەن مرۆڤەوە.
(٧) گواستنەوە بە ئوتومبیل یا مەكینەی تری خۆبزوێن.
(٨) لێخوڕین (بە مەكینە)، ***( A gasoline engine ~s the motorboat.)***.
(٩) كردن؛ حێبەجێكردن؛ راپەڕاندن؛ بە ئەنجام دان: ***( to ~ a bargain)***.
(١٠) راپێچكردنی نێچیر بۆناو تۆڕ یا داو.
***v.i.*** (١) دەرپەڕین بۆ پێشەوە بە قایمی‌و بە خێرایی.
(٢) پیادان؛ مستەكۆڵە؛ فڕێدان، تێهەڵدان، یا لێدان (تۆپ)؛ تەقاندن (مووشەك).
(٣) لێخوڕین (ئوتومبیل)؛ رۆیشتن: ***( The car ~s well.)***.
(٤) بە ئوتومبیل چوون یا گەشت كردن؛ گواستنەوە بە ئوتومبیل.
(٥) لێخوڕین (ئوتومبیل): ***( Can she ~ ? ; He ~s.)***.
***n.*** (١) لێخوڕینێك.
(٢) گەشتی ئوتومبیل: ***( We went for a ~ yesterday.)***.
(٣) رێی ئوتومبیل؛ رێگەوبان.
(٤) راپێچكردنی ئاژەڵ بۆ نیشانەكردن یا سەربڕین.
(٥) لێدان، فڕێدان، یا تێهەڵدانی تۆپ بە قایمی‌و بە خێرایی.
(٦) چۆنێتی ئەم فڕێدان یا تێهەڵدانە.
(٧) هەوڵ؛ كۆشش: ***( a ~ to raise money)***.
(٨) هێرشی سوپا.
(٩) ووزە؛ تاقەت؛ هێزی پاڵ پێوەنان یا هاندان؛ چالاكی:
***( a person with initiative and ~ )***
(١٠) دارو تەختەی سەرئاوكەوتوو.
(١١) ئەو بەشەی مەكینەیەك كە دەیبزوێنێت یا ائی دەخورێت.
(١٢) هەست یا خواستی بنچینەیی بەهێزو هاندەری مرۆڤ؛ هەوەس.
***( According to Freud, the sexual ~ is behind all human activities.)***
(١٣) [Colloq.]، رێگەیەكی تایبەتی ئوتومبیل لەنێوان ماڵێك‌و رێگەی گشتی یا شەقامدا.
**drive at,** مەبەست بوون (لە دووان)؛ ویستن:
***( What are you driving at?)***
**drive away,** (١) هەڵفڕاندن؛ قاودان؛ تەرەكردن؛ دەركردن.
(٢) بە ئوتومبیل رۆیشتن‌و بەجێهێشتنی شوێنێك.
**drive back,** گەڕاندنەوە بۆ دواوە؛ بەرهەڵستی كردن:
***( They drove back the enemy.)***
**drive out,** دەرپەڕاندن؛ دەركردن؛ شاربەدەركردن؛ پەرەوازەكردن:
***( to drive people out of their ancestral homeland)***
**drive-in** (drīv′in′), ***n.*** (١) بانق یا چێشتخانەیەك كە خەڵكی دەتوانن كاروباری بانقەكەیان جێبەجێ بكەن یا خواردەمەنی بكڕن هەر لەناو ئوتومبیلەكەیانەوە بەبێ ئەوەی دابەزن. (٢) سینەمایەكی سەروبەر بەرەڵایە كە خەڵكی دەتوانن لە ئوتومبیلەكانیاندا دانیشن‌و فیلمی تێدا ببینن بە شەو.
***adj.*** تایبەتی بە بانق، چێشتخانە، یا سینەمایەكی وەها.
**drivel** (driv′'l), ***v.i. & v.t.*** (١) ئاوی دەم تكان؛ ئاوتێزانە دەم.
(٢) قسەی قۆڕ كردن؛ قسەی هیچ‌وپووچ‌و بێ تام كردن.
***n.*** (١) لیك؛ ئاوی دەم. (٢) قسەی قۆڕو بێ تام.
-**driveler; driveller** *(n.).*
**driven** (driv′'n), *past participle of* **drive.**
***adj.*** (١) راماڵراوو كۆمەڵ كراو ***( ~ snow)***.
(٢) والێكراو؛ پاڵ پێوەنراو: ***( ~ mad)***.
**driver** (drīv′ẽr), ***n.*** (١) (ا) لێخوڕ (ئوتومبیل، گالیسكە، ئەسپ... هتد)؛ شۆفێر: ***( taxi- ~ )*** (ب) سوار (ئەسپ، ووشتر... هتد). (٢) شوان؛ گاوان.
(٣) كەسێك كە زۆر ئیش بە بەردەستەكانی دەكات‌و ماندوویان دەكات.
(٤) چەكوش. (٥) گورزی گۆڵف.
(٦) ئەو بەشەی مەكینە كە دەیبزوێنێت یا ائی دەخورێت.
**driver's license,** مۆڵەتی ئوتومبیل لێخوڕین.
**driver's seat,** بەدەسەڵات؛ سەرگەورە؛ لێپرسراو.
**driveway** (drīv′wā′), ***n.*** رێگەی ئوتومبیلی نێوان ماڵێك‌و شەقامەكەی بەردەمی.
**driving** (drīv′iŋ), ***adj.*** (١) بزوێن (مەكینە).
(٢) توند؛ توندوتیژ؛ قایم؛ بەتین: ***( a ~ rain)***.
(٣) چالاك؛ بەزەبر (مرۆڤ).
**drizzle** (driz′'l), ***v.i.*** تەپ‌وتم كردن؛ نمەنم بارین.
***n.*** تەپ‌وتم؛ نمەنمی باران؛ پرووشە باران.
-**drizzly** *(adj.).*
**droit** (droit), ***n.*** ماف.
**dromedary** (drom′ə-der′i), ***n.*** ووشتری عەرەبی؛ كە یەك كۆپارەی هەیەو زۆر خێرایە.
**drone** (drōn), ***n.*** (١) نێرە هەنگ (كە چزووی نییەو كارناكات‌و تەنها بۆ جووت بوون درووست بووە). (٢) كەسێكی بێكار كە رەنجی خەڵكی تر

دەخوات؛ مفتەخۆر؛ کەسێکی تەمەڵ کە بار بێت بەسەر خەڵکەوە.
(٣) فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان کە بە تەلسز لێ دەخوڕێنت.
*v.i.* مفت خواردن؛ تەمەڵی کردن و بوون بە بار بەسەر خەڵکەوە؛ کات کوشتن.

**drone** (drōn), *v.i.* (١) ووزەووزکردن؛ دەنگێکی یەك نەواو بەردەوام لێوەهاتن (وەك دەنگی پووره هەنگ). (٢) دووان بەشێوەیەکی یەك نەواو وشك.
*n.* (١) ووزەووز؛ دەنگێکی یەك نەواو بەردەوام. (٢) زوڕنا.
(٣) ئاوازێکی یەك نەواو نزم.

**drool** (drōōl), *v.i. & v.t.* (١) ئاو زانە دەمەوە؛ ئاوی دەم تکان.
(٢) [Slang]. قسەی قۆڕو بێ تام کردن؛ قسەی منداڵانەو هیچ‌وپووچ کردن.
*n.* (١) لیك؛ ئاوی دەم (٢) قسەی قۆڕو منداڵانە؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بێ تام.

**droop** (drōōp), *v.i.* (١) داکەوتن؛ شۆڕبوونەوە:
*( The branches of the willows ~ed over the water.; The leaves (flowers, plants, trees, etc.) were ~ing.)*
(٢) ووزە نەمان؛ لاوازبوون؛ هێز پێ نەمان
(٣) پەست بوون؛ مەلوول بوون؛ کۆست کەوتن: *( His spirits ~ed.)* .
*v.t.* شۆڕکردنەوە؛ داهێلان
*n.* شۆڕبوونەوە؛ داکەوتن.

**droopy** (drōōp'i), *adj.* داکەوتوو؛ شۆڕ؛ شۆڕبووەوە؛ پەست؛ مەلوول؛ غەمگین *( ~ eyes, flowers, leaves, spirits, etc.)* .
-droopily *(adv.)*; droopiness *(n.)*.

**drop** (drop), *n.* (١) دلۆپ؛ تنۆك؛ نمە. (٢) چۆڕ (ئاو، شلە).
(٣) نەختێ (٤) *(pl.)*، دەرمانی شلەی بە دلۆپ (دەرمانی چاو).
(٥) شتێکی خڕی بچووك (وەك: گوارە، موروو، نوقوڵ... هتد).
(٦) شکان (نرخ)؛ کەمبوونەوە؛ هاتنەخوارەوە: *( a ~ in prices)* .
(٧) کەوتنەخوارەوە؛ بەربوونەوە؛ داکەوتن؛ شۆڕبوونەوە.
(٨) شتێك کە دادەدرێتەوە یا بەردەدرێتەوە
(٩) ماوەی بەربوونەوە یا کەوتنەخوارەوەی شتێك؛ ماوەی نێوان شوێنێکی بەرزو شوێنێکی نزم: *( a ~ of fifty feet)* .
*v.i.* (١) دلۆپ دلۆپ هاتنەخوارەوە؛ تك تك لێ هاتنەدەرەوە.
(٢) کەوتنەخوارەوە؛ بەربوونەوە؛ کەوتن.
(٣) کەوتنە سەر زەوی (لەبەر ماندوویی، برینداری، یا مردن).
(٤) کەوتن (خەولێکەوتن): *( She ~ped off to sleep.)* .
(٥) دوایی هاتن؛ کۆتایی پێ هاتن؛ بڕینەوە: *( Let the matter ~ . )* .
(٦) شکان (نرخ، پلەی گەرما)؛ کەمبوونەوە؛ نزم بوونەوە.
(٧) بەربوونەوە یا هاتنەخوارەوە بە تەووژمی با یا ئاو.
(٨) زاین (گیاندار).
*v.t.* (١) تکاندن؛ بە دلۆپ دلۆپ بەردانەوە. (٢) هەڵپرژاندن.
(٣) بەردانەوە؛ خستنەخوارەوە؛ فڕێدان. (٤) زاین؛ ترەکین؛ بەچکەبوون.
(٥) بە لامسەرلایی پرتاندن (پێشنیار، ووتە، لاپلار).
(٦) ناردن (نامە) *( to ~ someone a line)*
(٧) خستن (بە بریندارکردن یا کوشتن).
(٨) بڕینەوە (باس)؛ وازلێهێنان؛ کۆتایی پێ هێنان: *( to ~ a subject)* .
(٩) شۆڕکردنەوە؛ نزم کردنەوە.
(١٠) بواردن یا پەڕاندنی تیپێك یا چەند تیپێك لە ووشەیەکدا.
(١١) هێلکە شکاندن و کردنە ناو ئاوی گەرمەوە بە ساغی بۆ کوڵاندنی.
(١٢) [Colloq.]. دانان یا بەجێهێشتنی کەسێك یا شتێك لە شوێنێکدا پاش گەیاندنی بۆ ئەو شوێنە: *( She ~ped him off at school.)* .
(١٣) [Slang]. پارە دۆڕاندن؛ لەکیس چوون

**at the drop of a hat,** زۆر بەئاسانی؛ یەکسەر؛ بێ ڕاڕایی؛ تەنها بە نیشانە پێدانێك.
**drop behind,** بەجێمان؛ دواکەوتن؛ کەوتنە دواوە.
**drop by,** سەرلێدانێکی کورت یا چاوەڕوان نەکراو.
**drop in,** سەرلێدانێکی کورت یا چاوەڕوان نەکراو.
**drop off,** (١) ڕۆیشتن؛ لە چاو وون بوون.
(٢) [Colloq.]. خەولێکەوتن
**drop out,** خۆکشانەوە (لە ئەندامێتی یا بەشداربوون)؛ وازهێنان.
**drop leaf,** لایەکی مێز کە دەنووشتێنرێتەوە لەکاتی بەکارنەهێناندا.

**droplet** (drop'lit), *n.* دلۆپێکی زۆر بچووك.

**drop letter,** نامەی ناوخۆ: نامەیەك کە دەگەیەنرێ بە خاوەنەکەی لەلایەن هەمان پۆستەخانەوە کە لێوەی نێردراوە.

**dropout** (drop'out'), *n.* قوتابی وازهێنەر لە خوێندن (بەتایبەتی هی ئاوەندی و ئامادەیی)

**dropping** (drop'iŋ), *n.* (١) خستنەخوارەوە؛ کەوتنەخوارەوە.
(٢) شلەی بە دلۆپ دلۆپ کەوتووەخوارەوە.
(٣) *(pl.)*، ڕیقنە و شیاکە و تەرس و پشقل.

**dropsy** (drop'si), *n.* ئاوبەنگ.
-dropsical *(adj.)*.

**droshky** (drosh'ki, drôsh'ki), *n.* گالیسکە؛ عەرەبانەی دوو-ئەسپی

**dross** (drôs, dros), *n.* (١) بەڵغ یا خڵتەو پیسی سەر ڕووی کانزای تواوە. (٢) زبڵ؛ پیسی؛ خڵتە؛ شتی هیچ‌وپووچ و بێ نرخ.
-drossiness *(n.)*; drossy *(adj.)*.

**drought** (drout), *n.* (١) بێ بارانی؛ ووشکە ساڵ؛ ووشکانی؛ کەم بارانی. (٢) نەبوونی؛ کەمی؛ قاتی (٣) [Archaic]، تینوێتی
-droughty *(adj.)*.

**drove** (drōv), *n.* (١) ڕان (ئاژەڵ)؛ گاگەلێك کە بەڕێوەبێت.
(٢) کۆمەڵە خەڵك (کە بجووڵێن یا بەڕێوەبن).
(٣) ئەسکەنەی خانووساز بۆ بەرد نەقاڕی کردن.
*v.t. & v.i.* (١) بەرد نەقاڕی کردن بە ئەسکەنەی تایبەتی.
(٢) [British]، شوانی یا گاوانی کردن؛ ئاژەڵ و گاگەل لێخوڕین.

**drove** (drōv), *past tense of* **drive**.

**drover** (drōv'ẽr), *n.* (١) ئاژەڵ لێخوڕ؛ ئاژەڵ بەر بۆ بازاڕ بۆ فرۆشتن.
(٢) دەڵاڵی ئاژەڵ کڕین و فرۆشتن.

**drown** (droun), *v.i.* خنکان لە ئاودا؛ نوقم بوون و مردن.
*v.t.* (١) خنکاندن لە ئاودا؛ نوقم کردن لە ئاوداو خنکاندن.
(٢) لە ئاو هەڵکێشان؛ لە ئاودا نوقم کردن؛ زۆر باش تەڕکردن.
(٣) مراندن (دەنگ): *( The few boos were ~ed out by applause.)*
(٤) لە کۆڵ کردنەوە؛ لەناوبردن؛ سەرنگوم کردن؛ نەهێشتن (بە نقوم کردن).
*( He ~ed his worries in drink.)*

**drowse** (drouz), *v.i.* وەنەوزەکوتان؛ خەوهاتن؛ خەولێکەوتن.
*v.t.* (١) هێنانە خەو؛ کردنە خەو؛ خەولێخستن؛ خاوکردنەوە.
(٢) بە وەنەوزەکوتان کات بەسەربردن.
*n.* وەنەوزەکوتێ؛ خەواڵوویی؛ خەوهاتن.

**drowsiness** (drou'zi-nis), *n.* وەنەوزەکوتێ؛ خەواڵوویی؛ خەوهاتن.

**drowsy** (drou'zi), *adj.* (١) خەواڵوو؛ خەوی دێت؛ وەنەوزەکوتێیەتی.
(٢) خەولێخەر؛ هێنەرەخەو. (٣) لە وەنەوزەکوتێ یا خەواڵوویی‌یەوە پەیدابوو

**drub** (drub), *v.t.* (١) دارکاری کردن؛ فەلاقەکردن.
(٢) بەزاندن (جەنگ، ملەملێ).
*n.* لێدان بە دار؛ فەلاقە؛ پیامالین

**drudge** (druj), *n.* کەسێك کە ئیشی دەستی قورس و ووشك و ناخۆش دەکات
*v.i.* ئیشی دەستی قورس و ووشك و ناخۆش کردن

**drudgery** (druj'ẽr-i), *n.* ئیشی دەستی قورس و ووشك و ناخۆش؛ کولەمەرگی؛ کوێرەوەری.

**drug** (drug), *n.* (١) دەرمان.
(٢) ماددەی بێ‌هۆشکەر (وەك: حەشیشە، تلیاك).
(٣) [Obs.]، ماددەی کیمیایی؛ خوێ.
*v.t.* (١) دەرمان پێدان. (٢) ژەهرتێکردن (خواردنەوە).
(٣) بێ هۆش کردن بە دەرمانی بێ هۆشکەرە؛ هەست سڕکردن.

**drug on the market,** کالایەکی بێ بازاڕ (لەبەر زۆرو زەبەنەیی).

**drug addict,** حەشیشەکێش؛ تلیاك خۆر.

**drugget** (drug′it), ***n.*** لباد؛ حەسیر

**druggist** (drug′ist), ***n.*** (١) دەرمانفرۆش: بازرگانی دەرمان.
(٢) دەرمانساز؛ دەرمانگەر؛ ئەجزاچی.

**drugstore** (drug′stôr′, drug′stōr′), ***n.*** دەرمانخانە؛ ئەجزاخانە.

**druid, Druid** (drōō′id), ***n.*** پیاوێکی ئاینی، جادووگەر، یا فاڵچی سیکلتەرەی کۆن.

**drum** (drum), ***n.*** (١) تەپڵ؛ دەهۆڵ
(٢) دەنگی دەهۆڵ؛ دەنگی تەپڵ لێدان. (٣) شتێك كە لە تەپڵ بكات.
(٤) بەكرە یا لوولەكی ئاسن (٥) پیپی ئاسن.
(٦) (ا) پەردەی گوێ (ب) گوێی ناوەڕاست.

***v.i.*** (١) تەپڵ لێدان؛ دەهۆڵ لێدان. (٢) شەقە لە باڵ هەڵسان.

***v.t.*** (١) تەپڵ لێدان؛ دەهۆڵ لێدان. (٢) كۆكردنەوە بە تەپڵ لێدان

**drum into,** پەیتا پەیتا بۆ دەرخستن یا پێ وتن

**drum out of,** (١) لە سوپا دەركردن بە تەپڵ لێدانەوە. (٢) دەركردن

**drum up,** (١) كۆكردنەوە یا بانگ كردن بە تەپڵ لێدان.
(٢) یارمەتی كۆكردنەوە بە داواكردن‌و ماڵ بە ماڵ گەڕان:
***( to drum up support for a cause)***

**drumbeat** (drum′bēt′), ***n.*** دەنگی دەهۆڵ؛ دەنگی تەپڵ لێدان

**drumhead** (drum′hed′), ***n.*** (١) چەرمی تەپڵ
(٢) پەردەی گوێی ناوەڕاست (٣) سەری بەكرەیەكی دەستاڕی كە شیشی پیادەكرێت بۆ بادانی بەكرەكەو گوریس هەڵكردن لەسەری.

**drumhead court-martial,** دادگای سوپایی مەیدانی جەنگ

**drum major,** سەردەستەی تەپڵ لێدەران لە خۆنوواندنێكدا

**drum majorette,** كچە سەردەستەی تەپڵ لێدەران.

**drummer** (drum′ẽr), ***n.*** (١) تەپڵچی؛ تەپڵ لێدەر؛ دەهۆڵ ژەن.
(٢) [Colloq.]، فرۆشیاری گەڕۆك.

**drumstick** (drum′stik′), ***n.*** (١) داری تەپڵ لێدان
(٢) لاخوارووی لاقە مریشكی كوڵاو یا هی باڵندەیەكی تر.

**drunk** (druŋk), *past participle of* drink.

***adj.*** (١) سەرخۆش؛ مەست؛ كەیل
(٢) شەیدا؛ شێت‌وشەیدا ***( ~ with joy, happiness, etc.)*** .

***n.*** [Slang], (١) كەسێكی سەرخۆش. (٢) ناهەنگی خواردنەوەی سەرخۆشكەر.

**drunkard** (drun′kẽrd), ***n.*** كەسێكی هەمیشە سەرخۆش؛ كەسێك كە زۆر زۆر دەخواتەوەو سەرخۆش دەبێت.

**drunken** (druŋ′kən), ***adj.*** (١) سەرخۆش؛ مەست
(٢) هەمیشە سەرخۆش (٣) لە ئەنجامی سەرخۆشی‌یەوەیە؛ لەكاتی سەرخۆشیدا ڕوویداوە.

**drunkenness** (druŋ′kən-nis), ***n.*** سەرخۆشی؛ مەستی؛ كەیلی.

**dry** (drī), ***adj.*** (١) ووشك؛ ووشك‌وبرنگ؛ بێ شێ (٢) ووشكانی.
(٣) بێ باران؛ كەم باران؛ ووشك. ***( a ~ summer)*** .
(٤) سیس؛ ووشكەوەبوو؛ هەڵپڕووكاو؛ هەڵقرچاو. (٥) تینوو.
(٦) ووشك كردوو (بیر، ئاژەڵ)؛ ووشك. ***( a ~ well, cow, sheep, etc.)*** .
(٧) بەبێ كەرەو مرەبا (نان): ***( a ~ toast)***
(٨) رەق؛ شلە نی‌یە؛ ووشك (خواردەمەنی)؛ ووشكەمەنی. ***( ~ foods)*** .
(٩) شیرین نی‌یە؛ شیرین نەكراو (شەراب): ***( ~ wine)*** .
(١٠) بەڵغەمی لەگەڵ نی‌یە؛ ووشك (كۆكە): ***( a ~ cough)***
(١١) خواردنەوەو فرۆشتنی یا تەنها فرۆشتنی شەراب‌و خواردنەوەی تری سەرخۆشكەری تێدا قەدەغەیە: ***( Kansas was a ~ State.)*** .
(١٢) سادە؛ ڕاستەوخۆ؛ بێ پێچ‌وپەنا؛ سارد. ***( ~ facts)*** .
(١٣) بێ سوود؛ بێ ئەنجام ***( a ~ interview)*** .
(١٤) ووشك (كار، بیروڕا)؛ ناخۆش (نیش، دووان): ***( a ~ lecture)*** .
(١٥) نادیارو بەتەوسەوەو ووشك ***( a ~ sense of humor)***

***n.*** [Colloq.], كەسێك كە دژی خواردنەوەو فرۆشتنی شەراب‌و خواردنەوەی تری سەرخۆشكەر بێت.

***v.t.*** ووشك كردنەوە.

***v.i.*** ووشكبوونەوە؛ كزربوونەوە.

**dry off,** ووشك كردنەوە (لەش).

**dry up,** (١) ووشك كردنەوە؛ ووشك كردن؛ هەڵقرچاندن:
***( The hot sun dried up all the puddles in the road.)***
(٢) ووشك بوون؛ هەڵقرچان (ڕووەك)؛ ووشكبوونەوە:
***( The streams dried up during the hot summer.)***
(٣) [Slang]، زمان یا دەم ووشك بوون؛ دەم بوون بە تەڵەوە؛ قسە پێ نەمان

**dryad, Dryad** (drī′əd, drī′ad), ***n.*** حۆری دارستان (ئەفسانەی یۆنانی).

-dryadic *(adj.).*

**dry cell,** شانەی ووشك (كارەبا)؛ باتری ووشك.

**dry-clean** (drī′klēn′), *v.t.* بە بەنزین یا شتی تری وەها شتن (جل).

-dry-cleaner *(n.).*

**dry cleaning,** بە بەنزین یا شتی تری وەها جل‌وبەرگ شتن؛ ووشكەشۆر كردن

**dry dock,** گۆمی كەشتی ووشك: گۆمێكە دەتوانرێت ئاوەكەی بەتاڵ بكرێتەوەو كەشتی تێدا دروست بكرێت یا چاك بكرێتەوە.

**dryer** (drī′ẽr), ***n.*** = **drier.**

**dry goods,** كووتاڵ‌و جل‌وبەرگ.

**dry ice,** سەهۆڵی ووشك (كە بریتی‌یە لە دووەم ئۆكسیدی كاربۆن كە بیبەستێت): بۆ ڕاگرتنی شت بە ساردی بەكاردێت، وەك ئێسقانی شكاوو لەجێ‌چوو بە گەرم‌وگووڕی كە تازە وای لێ هاتبێت.

**dry kiln,** كوورەی ووشك: بۆ ووشك كردنەوەی دارو تەختە بە گەرمی دەستكرد.

**dry law,** یاسای قەدەغەكردنی دروستكردن‌و فرۆشتنی شەراب‌و خواردنەوەی تری سەرخۆشكەر.

**dryly** (drī′li), ***adv.*** بە ساردی (لەگەڵ جووڵانەوە)؛ بە ووشكی‌یەكەوە.

**dry measure,** كێشەی ووشك: بۆ كێشان‌و پێوانی دانەوێڵەو خواردنی تری ووشك.

**dryness** (drī′nis), ***n.*** ووشكی.

**dry nurse,** دایەنێك كە مەمك نەدات بەو منداڵەی چاودێری دەكات.

**dry run,** [Military Slang], (١) تاقیكردنەوە یا ڕاهێنانێكی تفەنگچێتی بەبێ بەكارهێنانی گوللەو تەقەمەنی ڕاستەقینە (سوپا)؛ تاقیكردنەوەیەكە بەبێ بەكارهێنانی كەرەسەی ڕاستەقینە.
(٢) پەرداوە (بۆ هەر جۆرە ڕووداوێك).

**dry-salt** (drī′sôlt′), *v.t.* خوێ كردن بۆ پاراستن (گۆشت، قاوورمە).

**dry wash,** شۆراو و ووشك كراوە بەڵام لە ئوتو نەدراو (جل‌وبەرگ).

**duad** (dōō′ad, dū′ad), ***n.*** جووت؛ دوان.

**dual** (dōō′əl, dū′əl), ***adj.*** (١) دوان؛ جووت؛ جووتە؛ دوانە:
*( ~ ownership; ~ purpose)*
(٢) دوولایی؛ دووسرووشتی؛ دووكەرتی؛ دوانەیی؛ دووبوویی:
***( He has a ~ nature.)***
(٣) جووت (ڕێزمان)؛ جووت.

***n.*** ووشەی جووت یا دوانی (ڕێزمان): لە هەندێ زماندا وەك: عەرەبی، یۆنانی، سانسكریتی... هتد.

**dualism** (dōō′əl-iz′m, dū′əl-iz′m), ***n.*** (١) دوانەیی؛ دوولایی؛ دوو بەشی دژ بە یەك؛ جیاوازی؛ دووسرووشتی. (٢) تیۆری‌یەكە دەڵێت: جیهان لە دوو شت پێكهاتووە، مێشك‌و لەش، واتە بینراوو نەبینراو (فەلسەفە).
(٣) (ا) تیۆری‌یەكە دەڵێت: جیهان دوو هێزی دژ بە یەك بەڕێوەی دەبەن، باشی‌و خراپی (ئاین). (ب) بیروڕایەكە كە دەڵێت: مرۆڤ دوو سرووشتی هەیە، لەشی‌و گیانی.

**-dualist** *(n.).*

**duality** (dōō-al′ə-ti, dū-al′ə-ti), ***n.*** دووسرووشتی؛ دوولایی؛ ڕێبازی دوولاگری؛ دوو بەشی دژ بە یەك.

**dual personality,** کەسێکی دووسرووشت (دەروونناسی).

**dual purpose,** دوو کەلکدار؛ دوو کاری پێ دەکرێت.

**dub** (dub), *v.t.* (١) لێدان؛ پیادان؛ پیاماڵین. (٢) لێدان (تەپڵ). (٣) ناو، نازناو، یا سەرناو پێ بەخشین؛ ناوی گەورە لێنان. (٤) ساف‌ولووس و ڕێک کردن (دار، تەختە). (٥) نەرم و ساف‌ولووس کردن (چەرم). (٦) [Slang]: خراپ لێدان (گۆلف).

*n.* (١) دەنگی تەپڵ یا دەهۆڵ (٢) [Slang]: تەپڵ ژەنێکی نەشارەزا. (٣) [Slang]: کەسێکی حۆل ناکارامەی ناقۆلای هیچ نەزان.

**dub** (dub), *v.t.* تۆمارکردنی پارچە مۆسیقایەک لە پارچە مۆسیقایەکی ترەوە

*n.* گفتوگۆ و مۆسیقای تازە خراوەسەر فیلمی سینەما (بەتایبەتی هی فیلمێکی بێگانە).

**dub in,** (١) گفتوگۆ و مۆسیقا خستنەسەر فیلمی سینەما. (٢) گفتوگۆ و مۆسیقای نوێ خستنەسەر فیلمێکی سینەما لە جێی هی فیلمەکە خۆی

**dubious** (do͞o'bi-əs, dū'bi-əs), *adj.* (١) دوو مانا بەخش (تێبینی، ستایش)؛ گومان لێکراو: *( a ~ remark, compliment, etc.)* . (٢) دوودڵ؛ بەگومان: *( to feel ~ about something)* . (٣) ئەنجامی نازانرێ؛ خۆوبەختە؛ نازانرێ چۆن دەبڕێتەوە: *( a ~ battle)* . (٤) پشتی پێ نابەسترێ (مرۆڤ)؛ گومان لێکراو: *( a ~ person)* .

**dubitable** (do͞o'bi-tə-b'l, dū'bi-tə-b'l), *adj.* جێی گومانە؛ گومان لێکراو؛ مسۆگەر نییە

**ducal** (do͞o'k'l, dū'k'l), *adj.* تایبەتی بە دۆق یا دۆق نشین.

**ducat** (duk'ət), *n.* (١) دەکەت: پارەیەکی زێڕ یا زیوی ئەورووپایی کۆنە. (٢) [Slang]: بلیت

**duchess** (duch'is), *n.* (١) ژنە دۆق؛ ژنە میر. (٢) میری ژن یا بەگزادە ژنی سەرۆکی ناوچە.

**duchy** (duch'i), *n.* دۆق نشین؛ میرنشین؛ دۆقی ژن نشین.

**duck** (duk), *n.* (١) مراوی. (٢) مراوی مێینە. (٣) گۆشتی مراوی. (٤) [Colloq.]: کەسێکی خۆشەویست. (٥) [Colloq.]، کەسێکی سەیر. (٦) ئۆتۆمبیل یا هۆیەکی هاتوچۆی ڕەوڕەوەداری تەڕ و وشکانی.

**like water off a duck's back,** پێوەی نالکێت یا ناوەستێت؛ کاری تێ ناکات

**duck** (duk), *v.t. & v.i.* (١) خۆفرێدانە ناو ئاوەوە؛ خستنەناو ئاوەوە یا نوقم کردن بۆ ماوەیەک. (٢) بەپەلە خۆ لێ لادان (گوللە، بەرد، شتی فڕێدراو یا کەوتووە خوارەوە)؛ سەرداخەواندن. وەرگەڕان. خۆشاردنەوە یا خۆلادان بەپەلە بۆ شت بەرنەکەوتن. (٣) خۆ لێ دزینەوە (ئەرک، کار، کەس).

**duck** (duk), *n.* جۆرە کەتان یا قوماشێکی قایم.

**duckbill** (duk'bil'), *n. Also* **platypus,** گیاندارێکی ناوی بچووکی شیردەری هێلکەکەری قاچ تەنراوە دەنووکی لە هی مراوی دەچێت.

**ducking stool,** کورسی بێ پشتی لە ناو هەنگێشان: کورسی‌یەکی بێ پشتە مرۆڤی بەدکار و تاوانباری پێوە دەبەسترایەوە و دەخرایە ناو ئاوەوە (جۆرە سزایەک بوو بۆ ئافرەتی شەڕەنگێز لە ئەمەریکا).

**duckling** (duk'liŋ), *n.* بەچکە مراوی

**ducks and drakes,** یاری بەردهاویشتن بەسەر ڕووی ئەستێل یا گۆمێکی گەورەدا: بە مەرجێک چەند جارێک ڕووی ئاوەکە بپەڕێنێت ئەوسا بکەوێتە ناو ئاوەکەوە

**play ducks and drakes with one's money,** پارەی خۆ بەفیڕۆدان (وەک ئەوەی فڕێی بدەیتە ناو ئاوەوە).

**ducky** (duk'i), *adj.* [Slang], نایاب؛ زۆر خۆش و جوان و باش

**duct** (dukt), *n.* (١) بۆری؛ لوولە؛ ئاوبارە؛ جۆگە. (٢) بۆری، لوولە، یا دەماری ئاولەش (بۆ بردنی شلەی دەردراو یا پیسایی).

**ductile** (duk't'l, duk'til), *adj.* (١) جیر (کانزا)؛ دەکشێنرێت؛ قرچوک نییە *( ~ metals)* . (٢) پلاستیکی؛ شلک؛ نەرم.

(٣) بەئاسانی دابین دەکرێ یا بەڕێوە دەبرێ.

**dud** (dud), *n.* (١) فیشەکی بۆش یا چرووک؛ گوللە یا بۆمبایەک کە نەتەقیبێتەوە. (٢) کەسێکی چرووک؛ کەسێکی بێ هونەر، کوونی، یا هیچ‌وپووچ؛ شتێکی پووچەڵ یا چرووک.

**dude** (do͞od, dūd), *n.* (١) پیاوێکی زۆر تەڕپۆش؛ پیاوێک کە ئەوەندە بە تەنگ جل‌وبەرگ و ڕووالەتی‌یەوە دێت بە پەلەپیتکە خۆی دەتەکێنێ. (٢) [Slang]، شلەشاری؛ کابرا؛ زەلام (بەتایبەتی دانیشتووی شار یا گەشتیار)

**dude ranch,** گەشتگای دەرەوەی شار کە گەشتیاران بە سواری ئەسپ و مەلە و وەرزشتی ترەوە کات بەسەردەبەن تیایدا.

**due** (do͞o, dū), *adj.* (١) کاتی دانەوەیەتی (قەرز): *( The first payment is ~ . ; The rent is ~ .)* (٢) ڕەوا؛ شایستە: *( Give him ~ respect.)* . (٣) (ا) ئەوەندەی یا ئەوەی پێویستە: *( ~ care)* (ب) لە کاتی خۆیدا؛ چۆن پێویستە وەها: *( in ~ time; in ~ course)* (٤) کاتی خۆیەتی؛ کاتی گەیشتنێتی (فڕۆکە، شەمەندەفەر، پاس... هتد): *( The plane is ~ at 6:00 P.M.)*

*adv.* بەتەواوی؛ تەواو؛ یەکسەر (ئاراستە): *( ~ west)* .

*n.* (١) ئەوەی کاتی دانەوەیەتی؛ ئەوەی ڕەوایە یا شایستەیە. (٢) (*pl.*)، ئابوونە.

**become (or fall) due,** کاتی دانەوەی یا دانی دەبێت.

**due to,** لەبەر؛ بەهۆی.

**give the devil (or a person) his due,** مافی خۆ پێدان ئەگەرچی پێشی ڕەوا نەبێت

**due date,** ڕۆژی دانەوە (قەرز)؛ ڕۆژی گەڕاندنەوە (شتی خواستراو).

**duel** (do͞o'əl, dū'əl), *n.* (١) شیربازی؛ شەڕەشیر؛ شمشێربازی. (٢) دووبەرەکی؛ ملەملێ؛ شەڕ (بە دەم): *( a verbal ~ )* .

*v.i. & v.t.* شیربازی کردن؛ شەڕەشیرکردن.

**duelist, duellist** (do͞o'əl-ist, dū'əl-ist), *n.* شیرباز.

**dues** (do͞oz, dūz), *n.pl.* ئابوونە.

**duet** (do͞o-et', dū-et'), *n.* (١) گۆرانی یا ئاوازی دووقۆڵی. (٢) دوو کەس کە پێکەوە گۆرانی بڵێن یا مۆسیقا لێ بدەن.

**duffel, duffle** (duf''l), *n.* (١) قوماشێکی خوری ئەستوورە. (٢) پێویستی ڕاوچی، کەشتی‌یەوان، یا دەشتەوانێک کە لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن. (٣) پێویستی کەسێک کە دەچێتە چادرگا و لەگەڵ خۆیدا دەیبات

**duffel bag,** توورەکەیەکی ئەستوورە ووردەشتی تێ دەکرێ و دەدرێ بەسەر شاندا.

**duffer** (duf'ẽr), *n.* (١) [Obs.]، دەستگێڕ (بەتایبەتی هی خشڵ و شتی وەهای هەرزانبەها). (٢) [Slang]، کەسێکی ناکارامە، حۆل، یا بێ مێشک.

**dug** (dug), *past tense and past participle of* **dig.**

**dug** (dug), *n.* گوان؛ گۆمەمکی گیاندار.

**dugout** (dug'out'), *n.* (١) بەلەمێکە لە دارێکی هەڵکەندراو کراوە. (٢) پەناگا. (٣) کونجێکە یاریکەرانی "بێسبۆل" تێدا کۆدەبنەوە کاتی حەوانەوە

**duke** (do͞ok, dūk), *n.* (١) دۆق: شازادەیەکە کە فەرمانڕەوای ناوچەیەکی سەربەخۆیە. (٢) شازادە؛ بەگزادە.

**dukedom** (do͞ok'dəm, dūk'dəm), *n.* (١) دۆق نشین؛ شازادەنشین. (٢) پلەوپایەی دۆق.

**dulcet** (dul'sit), *adj.* (١) خۆش ئەوا؛ خۆش ئاواز. (٢) [Archaic]، خۆش (تام، بۆن)؛ شیرین.

**dulcimer** (dul'sə-mẽr), *n.* سەنتوور.

**dull** (dul), *adj.* (١) بێ مێشک؛ کەر؛ تێنەگەیشتوو. (٢) بێ هەست؛ هەست مردوو: *( ~ to grief)* . (٣) سست؛ خاو. (٤) دڵ مردوو؛ سارد؛ ووشک؛ مردوو. (٥) ووشک و ناخۆش؛ ناخۆش؛ ووشک (مەجان)؛ بێ تاقەتکەر.

*( a ~ party, lecture, meeting, etc.)*

(٦) کول *( a ~ blade)*

(٧) بێ ڕەنگ؛ کاڵ؛ مردوو (ڕەنگ). *( a ~ color)* .

(٨) ناتوندوتیژ؛ سووک *( a ~ headache)* .

(٩) باش نانارسرێتەوە یا دیاری ناکرێت (دەنگ، تەپە): *( a ~ thud)* .

(١٠) ناسوودە نەبەخش؛ ناخۆش: *( ~ weather)* .

(١١) کز (بازاڕ) *( Business is ~ .)* .

*v.t. & v.i.* (١) سڕکردن (هەست)؛ سڕبوون؛ خاوکردنەوە.

*( to ~ the senses)*

(٢) بێ مێشک کردن؛ بێ مێشک بوون *( to ~ the mind)*

(٣) کول کردن؛ کول بوون.

**-dullness; dulness** *(n.)*; **dully** *(adj.)*.

**dullard** (dul′ẽrd), *n.* کەسێکی کەرو بێ مێشک

**duly** (dōō′li, dū′li), *adv.* (١) بەپێی دەستوورو نەریت؛ بەرێکوپێکی؛ چۆن پێویستە وەها *( a ~ - elected president)* .

(٢) لە کاتی خۆیدا؛ بەبێ دواکەوتن.

**dumb** (dum), *adj.* (١) لاڵ؛ بێ زمان

(٢) زمان بەستراو (لە ترس، خورپە، یا حەپەساندا) (٣) بێ دەنگ.

(٤) [Colloq.]. گەمژە؛ بێ مێشک؛ گێل؛ کەر؛ دەبەنگ؛ کەودەن.

**play dumb,** خۆ گێل کردن؛ خۆ بە گێل پیشاندان

**dumbbell** (dum′bel′), *n.* (١) ئاسنێکە هەردوو سەری تۆپە ئاسنە بە دەست بەرزدەکرێتەوە بۆ ماسولکە بەهێزکردن

(٢) [Slang]. کەسێکی کەرو گێژو بێ مێشک

**dumbfound** (dum′found′), *v.t.* = **dumfound.**

**dumb show,** (١) شانۆگەری یا نوواندنێکی بێ دەنگ.

(٢) نیشانەی بێ دەنگ؛ دەستو دەموپلو چاو جوولاندن بەبێ دەنگ.

**dumbwaiter** (dum′wāt′ẽr), *n.* (١) تەپەکێکی بچووکە دەخرێتە لای مێزی نانخواردنەوە (٢) ئەسانسێری چێشتخانە بۆ هێنانو بردنی خواردەمەنی و قاپوقاجاغ لە نهۆمێکەوە بۆ یەکێکی تر.

**dumdum (bullet),** گوللەی دەمدەم گوللەیەکی لووت نەرمە کە لە نیشانەکەیدا دەناوسێتو دەبێتە هۆی برینێکی گەورە.

**dumfound** (dum′found′), *v.t.* سەرسام کردن؛ حەپەساندن؛ سەرسوڕمەندنو زمان بەستن.

**dummy** (dum′i), *n.* (١) کەسێکی لاڵ یا بێ زمان

(٢) پەیکەری وەك ئادەمیزاد بۆ پیشاندانی جلوبەرگ لە فرۆشگادا؛ بووکەشووشە (٣) شتێکی درۆزنە (٤) دەسکەلا؛ نۆکەر؛ کەسێك کە بەسەرزاری سەربەخۆ بێت، بەڵام لە ژێرەوە دەسکەلای کەسێکی تر بێت.

(٥) [Slang]. کەسێکی کەرو بێ مێشكو گێژ.

(٦) گەلالەی چاپەمەنی (٧) مەکینەی شەمەندەفەری دەنگ کپ کراو.

*adj.* (١) بێ دەنگ (٢) درۆزنە؛ ڕووکەش؛ ساختە.

(٣) دەسکەلا؛ هەر بەناو *( a ~ corporation)*

**dump** (dump), *v.t.* (١) هەڵڕشتن؛ ڕۆکردن؛ ڕشتن

(٢) فڕێدان (٣) شتومەك خستنە ناو بازاڕەوە بە نرخێکی هەرزان.

*v.i.* (١) هەڵڕژان؛ کەوتنەخوارەوەو کۆمەڵ بوون.

(٢) زبڵ فڕێدان (٣) بازاڕ پڕکردن لە شتومەك بە نرخی هەرزان.

*n.* (١) سەرەنوێلك

(٢) شوێنی تێ فڕێدانو هەڵڕشتنی شتی بێ نرخ یا نەویستراو

(٣) شوێنێکی سەردەمی لە مەیداندا بۆ دابەشکردنی تەقەمەنی، خواردەمەنی، یا جلوبەرگ بەسەر لەشکردا.

(٤) [Slang]. شوێنێکی ناخۆشو ناشرینو بێ ناسوودە

(٥) [Slang]. هەرشوێنێك؛ جێگەیەك

**dump** (dump), *n.* [Archaic]. (١) ئاواز یا گۆرانییەکی دڵگیر.

(٢) گۆرانی یا ئاواز

**in the dumps,** پەست مەبوون؛ غەمبار؛ خەفەتبار:

*( He is down in the dumps.)*

**dumpling** (dump′liŋ), *n.* (١) تۆپەڵە هەویرێکی خڕە وەك کفتەی بچووك کە لەناو شۆربا یا شلەدا دەکوڵێنرێت.

(٢) شیرینییەکە بریتییە لە پارچە نانی لە میوە پێچراوەو پیشێنراو.

(٣) [Colloq.]، کەسێك یا گیاندارێکی کورتو قەڵەو.

**dump truck,** گەلاَبە.

**dumpy** (dump′i), *adj.* کورتو تۆکمە؛ کورتو قەڵەو.

**dumpy** (dump′i), *adj.* پەست؛ غەمبار؛ خەفەتبار.

**dun** (dun), *adj.* دێز؛ بۆر.

*n.* (١) ڕەنگی دێز یا بۆر. (٢) جۆرە مێشێکە.

**dun** (dun), *v.t. & v.i.* پەیتا پەیتا داوای قەرزکردنەوە.

*n.* کەسێك کە پەیتا پەیتا داوای قەرزەکەی دەکاتەوە.

**dunce** (duns), *n.* (١) کەسێکی نەزانو ووشك.

(٢) کەسێکی دەبەنگ، کەودەن، گەلۆر، یا بێ مێشك.

**dune** (dōōn, dūn), *n.* گردۆلکەی لم.

**dung** (duŋ), *n.* (١) شیاکە؛ سەنێر؛ تەپاڵە؛ ڕیتاڵە.

(٢) پیسایی؛ پیسی.

*v.t.* پەیناوکردن (کێڵگە).

**dungaree** (duŋ′gə-rē′), *n.* (١) جۆرە قوماشێکی ئەستوورە.

(٢) *(pl.)*، پانتۆڵ یا بەرگی سەرتاپای لەم قوماشە دروستکراو (بەرگی کار).

**dung beetle,** قالۆنچەی ناو شیاکەو سەر سەرەنوێلك.

**dungeon** (dun′jən), *n.* (١) سەنگەری ناو قەڵا؛ قەڵا

(٢) زیندان؛ ژوورێکی تاریکی ژێرزەمین (لە بەندیخانەدا یا وەك بەندیخانە ناخۆش).

**dunghill** (duŋ′hil′), *n.* (١) سەرەنوێلك؛ کۆمەڵە شیاکە یا تەپاڵە.

(٢) شتێکی پیس.

**dunk** (duŋk), *v.t. & v.i.* لە قاوە، شیر، یا شۆربا هەڵکێشان پێش خواردنی (کێك، نان، بسکویت... هتد).

**dunnage** (dun′ij), *n.* (١) ئاوناخنی نەرم کە دەخرێتە ژێر سندووقو دەوروپشتی بۆ پاراستنی لەسەر کەشتی. (٢) جانتاو باوڵو کەلوپەل.

**duo** (dōō′ō, dū′ō), *n.* گۆرانی یا ئاوازی دووقۆڵی.

**duodecimal** (dōō′ə-des′ə-m′l, dū′ə-des′ə-m′l), *adj.* دوانزەهەم؛ تایبەتی بە دوانزە یا دوانزەیی.

*n.* (١) دوانزەیەك. (٢) *(pl.)* ، شێوازی ژماردنی دوانزەیی (بیرکاری).

**duodenum** (dōō′ə-dē′nəm, dū′ə-dē′nəm), *n.* ڕیخۆڵەی دوانزەگری.

**duologue** (dōō′ə-lôg′, dū′ə-lôg′), *n.* گفتوگۆی دووقۆڵی (بەتایبەتی لەسەر شانۆ).

**dupe** (dōōp, dūp), *n.* کەسێکی خۆش باوەڕ یا ساویلکە؛ کەسێکی بەئاسانی هەڵخەڵەتێنراو.

*v.t.* خەڵەتاندن؛ فریودان؛ لەخشتەبردن؛ ساختە لێکردن.

**dupery** (dōōp′ẽr-i, dūp′ẽr-i), *n.* ساختە؛ ساختە لێکردن؛ خەڵەتاندن.

**duple** (dōō′p'l, dū′p'l), *adj.* دوو ئەوەندە؛ دوانە؛ دوان.

**duplex** (dōō′pleks, dū′pleks), *adj.* (١) دوو ئەوەندە

(٢) دوولا یا دووبەش (مەکینە).

*n.* (١) خانوویەکی دوولا یا دوو بەش (کە هەر بەشەیان سەربەخۆیەو بۆ خێزانێکە). (٢) ژوورێکی دووخانەیی لە شەمەندەفەردا.

**duplex apartment,** خانوویەکی دوو نهۆمی.

**duplex house,** خانوویەکی دوو بەش (کە هەر بەشەیان سەربەخۆبێو ماڵێکی تێدابێت)

**duplex telegraphy,** ناردنی دوو برووسکە بە یەك تەلدا لە یەك کاتداو بۆ دوو لای جیاواز.

**duplicate** (dōō′plə-kit, dū′plə-kit), *adj.* (١) دوان؛ دوانە.

(٢) دەقاودەق. (٣) دوو بەشی چوونیەکی هەیە.

*n.* (١) وێنەی دەقاودەق. (٢) هاوتا؛ بەرامبەر.

*v.t.* (١) دوو قات کردن؛ دوو ئەوەندە کردن.
(٢) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان؛ لەسەر دەرهێنان؛ لەبەرگرتنەوە.
(٣) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە (کردار، کار، ڕەفتار):
***(She ~ her former success.)***
**in duplicate,** بە دوو وێنەی دەقاودەق
**duplicating machine,** مەکینەی وێنەی دەقاودەق دەرهێنان.
**duplication** (dōō´plə-kā′shən, dū´plə-kā′shən), *n.* (١) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان؛ دووبارەکردنەوە. (٢) وێنەی دەقاودەق.
**duplicator** (dōō′plə-kā´tēr, dū′plə-kā´tēr), *n.* مەکینەی وێنەی دەقاودەق دەرهێنان.
**duplicity** (dōō-plis′ə-ti, dū-plis′ə-ti), *n.* دووڕوویی؛ دووزمانی؛ فێڵ و تەڵەکەبازی
**durability** (door´ə-bil′ə-ti, dyoor´ə-bil′ə-ti), *n.* بەرگەگرتن؛ قایمی؛ مانەوە و نەدڕان، نەشکان، یا نەفەوتان؛ بەردەوامی.
**durable** (door′ə-b'l, dyoor′ə-b'l), *adj.* (١) بەرگەگر؛ قایم؛ بەتین؛ بەکێش؛ بەگیر: ***(~ cloth; a ~ pair of shoes)***.
(٢) چەسپیو؛ نەگۆڕ؛ بەردەوام: ***(a ~ peace)***.
**dura mater,** پەردەی هەرە دەرەوەی مێشک و بڕبڕاگەی پشت (کە قایم و بەکێشە.
**duramen** (dyoo-rā′min), *n.* ناوجەرگەی ڕەقی قەدی درەخت
**durance** (door′əns, dyoor′əns), *n.* بەندی؛ خستنە بەندیخانەوە؛ خرانە زیندانەوە
**duration** (doo-rā′shən, dyoo-rā′shən), *n.* (١) بەردەوام بوون؛ بەردەوامی؛ مان. (٢) ماوەی خایاندن؛ ماوەی بەردەوام بوون؛ ماوە.
**duress** (doo-res′, dyoo-res′), *n.* (١) بەندی؛ خستنە بەندیخانەوە؛ خرانە زیندانەوە. (٢) زۆرەملێ؛ زۆر؛ بە زۆر؛ تۆبزی:
***(to do something under ~ ; a confession signed under ~ )***
**during** (door′iŋ, dyoor′iŋ), *prep.* (١) بە درێژایی (کات)؛ لەکاتی؛ لە ماوەی ***(The sun gives us light and heat ~ the day.)***.
(٢) لەکاتی؛ لە کاتێکدا: ***(He left ~ the lecture.)***.
**dusk** (dusk), *adj.* [Poetic], ڕەشباو؛ ڕەشتاڵە؛ تاریک.
*n.* (١) زەردەپەڕ؛ تاریک و لێڵی پاش ڕۆژئاوابوون. (٢) تاریکی.
*v.t. & v.i.* تاریک کردن؛ تاریک داهاتن
**dusky** (dus′ki), *adj.* (١) ڕەشباو؛ ڕەشتاڵە. (٢) تاریک؛ لێڵ.
(٣) غەمگین؛ بەرچاو تاریک؛ پەست؛ خەفەتبار.
**-duskily** *(adv.)*; **duskiness** *(n.)*.
**dust** (dust), *n.* (١) تەپ و تۆز؛ تۆز.
(٢) هەندێکی زۆر تەپ و تۆز کە وەک پەڵە هەور بوەستێت.
(٣) پشێوی؛ سەر لێ شێواوی؛ هەراوهوریا. (٤) خاک؛ خۆڵ؛ گڵ.
(٥) پاشماوەی لەشی ڕزیو کە دەبێت بە خۆڵ یا گڵ.
(٦) ڕیسوایی؛ سەرشۆڕی. (٧) شتێکی بێ نرخ و هیچ و پووچ.
(٨) [British]، زبڵ؛ خاک و خۆڵ. (٩) [Rare]، گەرد.
(١٠) هەڵاڵە. (١١) تۆزقاڵە زێڕ. (١٢) [Slang]، پارە؛ دراو.
*v.t.* (١) تەپ و تۆز پێوەکردن؛ تۆزاوی کردن
(٢) پۆدرە پێوەکردن؛ پۆدرە لێدان.
(٣) (off ~)، تەکاندن؛ پاکردنەوە؛ گسک لێدان؛ سڕین و تەپ و تۆز لێ لابردن.
*v.i.* (١) تەکاندن؛ سڕین و تەپ و تۆز لێ لابردن؛ پاکردنەوە.
(٢) خۆگەوزاندن لە تەپ و تۆزدا (باڵندە).
(٣) تەپ و تۆزاوی بوون؛ خۆڵاوی بوون
**bite the dust,** لە جەنگدا کوژران؛ بەزین.
**lick the dust,** (١) لە جەنگدا کوژران؛ بەزین
(٢) کڕنووش بردن؛ سەر دانەواندن
**make (raise) a dust,** کردن بە تەپ و تۆز؛ ئاژاوەنانەوە؛ هەراوهوریا خستنەوە
**throw dust in (someone's) eyes.** بەهەڵەدابردن؛ خەڵەتاندن؛ چاوبەست کردن
**dustbin** (dust′bin´), *n.* تەنەکەی خۆڵ؛ خۆڵدان؛ زبڵدان.
**dust bowl,** ناوچەیەک کە بێ بارانی وەک بیابانی لێ دەکات.
**duster** (dus′tēr), *n.* (١) تەپ و تۆز پاکەرەوە یا سڕەوە (مرۆڤ، شت)؛ فڵچە؛ پەڕۆ یا ئیسفەنجی شت سڕینەوە. (٢) تەختەسڕ.
(٣) ئامێری پۆدرە لێدان. (٤) ئامێری خوێ یا شەکر پێوەکەر؛ خوێدان.
(٥) پاڵتۆ یا چاکەتی پاراستنی جل و بەرگ لە تۆزاوی بوون لەکاتی گەشتکردندا بە ئوتومبیلی سەرکراوە.
**dustman** (dust′mən), *n.* خۆڵڕێژ.
**dustpan** (dust′pan´), *n.* ئەفرێکی بچووکی دەم پانە خۆڵی پاش گسکدانی تێ دەکرێت و پێی دەکرێتە ناو تەنەکەی خۆڵەوە.
**dustproof** (dust′prōōf´), *adj.* تەپ و تۆزبڕ.
**dust storm,** گەردەلوول.
**dusty** (dus′ti), *adj.* (١) خۆڵاوی؛ تەپ و تۆزاوی
(٢) وورد وەک تۆز. (٣) بۆر
**Dutch** (duch), *adj.* (١) تایبەتی بە هۆڵەندە (گەل، زمان، کلتوور).
(٢) [Slang]، ئەڵمانی.
*n.* (١) زمانی هۆڵەندی. (٢) [Slang]، ئەڵمانی.
(٣) گەلی هۆڵەندە. (٤) [Slang]، گەلی ئەڵمانیا.
**go Dutch,** [Colloq.], پارەی خۆ دان و کەس وێری کەس نەکردن (چێشتخانە، سینەما، گەشت، ئاهەنگ... هتد)؛ بە لێفەی خۆ نووستن (مەجاز).
**Dutch courage,** (١) ئازادییەک کە لە خواردنەوەوە بێت؛ ئازایی سەرخۆشی. (٢) خواردنەوەی سەرخۆشکەر.
**Dutch door,** دەرگای دوو بەشی لە باری لابەلا بەمەرجێک بتوانرێت بەشی سەرەوە و خوارەوەی بە جیا بکرێتەوە یا دابخرێت.
**Dutch oven,** (١) مەنجەڵێکی سەر قۆقزە کە گۆشت و خواردەمەنی تری لە فڕندا تێدا دەپێشێنرێت. (٢) کوورەیەکە لایەکی بەرەڵایە و سەرەکەی گیراوە ڕووی لا بەرەڵاکەی دەکرێتە ئاگر و گۆشتی تێدا دەبرژێنرێ. (٣) تەنوور
**Dutch treat,** [Colloq.], پارەی خۆ دان و کەس وێری کەس نەکردن (چێشتخانە، سینەما، گەشت، ئاهەنگ... هتد)؛ بە لێفەی خۆ نووستن (مەجاز).
**Dutch uncle,** [Colloq.], کەسێک کە بە توندوتیژی و بە ڕەقی تەمێی کەسێکی تر بکات
**duteous** (dōō′ti-əs, dū′ti-əs), *adj.* گوێ ڕایەڵ؛ گوێگر؛ ملکەچ.
**dutiable** (dōō′ti-ə-b'l, dū′ti-ə-b'l), *adj.* گوومرگی لەسەرە (شتومەکی لە دەرەوە هێنراو)؛ گوومرگ دەکرێت؛ پێویستە گوومرگ بکرێت.
**dutiful** (dōō′ti-fəl, dū′ti-fəl), *adj.* (١) لە هەستکردن بە پێویستی سەرشانەوە هاتووە. (٢) گوێ ڕایەڵ؛ گوێگر؛ ملکەچ.
**duty** (dōō′ti, dū′ti), *n.* (١) ڕێز.
(٢) پێویستی سەرشان؛ ئەرک؛ ئەرکی سەرشان
(٣) باجی گوومرگ؛ گوومرگ
(٤) پلەی بەکاری مەکینە؛ بەکاری مەکینە: ***(a heavy- ~ tractor)***
**do duty for,** جێگری کردن؛ لەباتی بوون؛ جێ گرتنەوە.
**off duty,** پاش کار؛ دوای ئیشی ڕۆژانە؛ دەستبەتاڵ.
**on duty,** لەسەر کار؛ لەکاتی ئیشدا
**duty-free** (dōō′ti-frē′, dū′ti-frē′), *adj. & adv.* گوومرگ لەسەر نەبوو؛ باجی گوومرگی لەسەر نادرێت.
**dwarf** (dwôrf), *n.* (١) کورتەباڵا؛ کورتەبنە؛ کورتەباڵایەک.
(٢) گیاندار یا ڕووەکی بچووکتر لە توخمی خۆی.
*v.t.* (١) نەهێشتنی گەورەبوون؛ ڕێگرتن لە پەرەسەندن (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەک).
(٢) بچووک کردنەوە. (٣) بوون بە هۆی بچووک نوواندن؛ باشتر و جوانتر و کارامەتر نوواندن (لە بەراورددا): ***(He ~s everybody around him.)***
*v.i.* گەورەنەبوون؛ بچووک نوواندن.
*adj.* بچووک؛ کورتەباڵا؛ کورتەبنە.
**dwarfish** (dwôrf′ish), *adj.* کورتەباڵا؛ کورتەبنە؛ بچکۆلە
**dwell** (dwel), *v.i.* نیشتەجێبوون؛ لە شوێنێکدا ژیان بۆ ماوەیەک یا

به یەکجاری
**[ to ~ in the country (in the city, in England, etc.) ]**
**dwell on** (or **upon**), زۆر بیرلێکردنەوە؛ زۆر لەسەر ڕۆیشتن (دووان، نووسین)؛ دریژەپێدان: *( Don't dwell too much on past failures.)*.
**dweller** (dwel'ẽr), *n.* نیشتەجێ؛ دانیشتوو: *( a city- ~ )*.
**dwelling** (dwel'iŋ), *n.* مال؛ جێ نشینگە؛ خانوو.
**dwelt** (dwelt), *alternative p.p. and past tense of* **dwell**.
**dwindle** (dwin'd'l), *v.i.* کەمبوونەوە؛ کزبوون؛ چوونەوەیەك
*v.t.* کەمکردنەوە؛ کەمکردن
**dyad** (dī'ad), *n. & adj.* جووت؛ دوو؛ دوان
**dyarchy** (dī'är-ki), *n.* جووت فەرمانڕەوایی (لە یەك ناوچەدا).
**dye** (dī), *n.* (۱) خوم (۲) ڕەنگ؛ بۆیە
*v.t.* ڕەنگ کردن؛ لە خوم دان؛ لە خوم هەڵکێشان.
*v.i.* ڕەنگ گرتن
**of deepest dye,** بەدترین؛ خر پترین
**dyed-in-the-wool** (dīd'n-thə-wool'), *adj.* (۱) لە خوم دراوە پێش ڕستنی (۲) نەگۆڕ
**dyeing** (dī'iŋ), *n.* لە خوم هەڵکێشان؛ لە خوم دان؛ ڕەنگ کردن
**dyer** (dī'ẽr), *n.* خومچی
**dying** (dī'iŋ), *present participle of* **die.**
*adj.* (۱) لە سەرەمەرگدایە؛ گیان دەدات؛ لە مردندایە.
(۲) لە نەماندایە؛ بەرەو نەمان دەچێت: *( a ~ social order)*.
(۳) تایبەتی بە مردن
*n.* مردن؛ کۆچی دوایی کردن
**dyke** (dīk), *n. & v.t.* = **dike.**
**dynam-** (dī'nəm), = **dynamo-**.
**dynamic** (dī-nam'ik), *adj.* (۱) تایبەتی بە هێز، تین، یا جموجوول (۲) چوستوچالاك؛ چالاك؛ بەتین. (۳) بگۆڕ؛ هەمیشە بگۆڕ.
**dynamics** (dī-nam'iks), *n.pl.* (۱) دینامیك: لقێکە لە زانستی فیزیا کە لە کارتێکردنی هێز یا تین لەسەر شتی جووڵاو یا نەجووڵاو دەکۆڵێتەوە.
(۲) هێزی جووڵێنەر (بینراو یا نەبینراو).
**dynamism** (dī'nə-miz'm), *n.* (۱) ئەو تیۆرییەیە کە دەڵێت هێز یا تین و کارکردنە سەر شت بنچینەی هەموو دیاردەیەکی سرووشتی و ژیانە. (۲) چوستوچالاکی؛ چالاکی.
**dynamite** (dī'nə-mīt'), *n.* دینامیت
*v.t.* ڕووخاندن، تەقاندنەوە، یا پارچە پارچە کردن بە دینامیت
**dynamo** (dī'nə-mō'), *n.* دینەمۆ؛ دروستکەری کارەبا
**dynamo-** (dī'nə-mō), *Also* **dynam-**, پێشگرێکە بەمانای هێز؛ تین
**dynamometer** (dī'nə-mom'ə-tẽr), *n.* پێوەری هێز یا تین
**dynamometry** (dī'nə-mom'ə-tri), *n.* پێوانی هێز یا تین
**-dynamometric** *(adj.)*: **dynamometrical** *(adj.)*.
**dynast** (dī'nast, dī'nəst), *n.* فەرمانڕەوا یا حوکمڕان (بەتایبەتی یەکێك کە لە باوباپیرییەوە بۆی مابێتەوە).
**dynasty** (dī'nəs-ti), *n.* بەرە یا بنەچەی حوکمڕانان؛ خێڵ یا هۆزی فەرمانڕەوایان (کە بۆ ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایی وڵاتێك دەکەن).
**dys-** (dis), پێشگرێکە بەمانای: بەد؛ خراپ؛ سەخت
**dysentery** (dis''n-ter'i), *n.* زەحیری؛ دیزەنتری: نەخۆشی سك-ئێشە و سکچوون و خوێن لە پیسایدا بوون
**dysfunction** (dis-fuŋk'shən), *n.* باش کارنەکردنی ئەندامێکی لەش
**dyslexia** (dis-lek'si-ə), *n.* توانای خوێندنەوە کەم بوون بەهۆی پاش و پێشخستنی تیپەکانەوە (نەخۆشی)
**-dyslexic** *(adj.)*.
**dyspepsia** (dis-pep'shə, dis-pep'si-ə), *n.* گرفت؛ گرفت کردن.
**dyspeptic** (dis-pep'tik), *adj.* (۱) گرفتکەر. (۲) بەرچاو تاریك؛ دەموچاوگرژ؛ ڕەشبین
*n.* کەسێکی گرفت کردوو.
**dysphonia** (dis-fō'ni-ə), *n.* دەنگ نووسان و باش قسە بۆ نەکران (نەخۆشی).
**dysphoria** (dis-fôr'i-ə, dis-fō'ri-ə), *n.* هەستکردن بە مەراق و بێ ئارامی و ڕازی نەبوون لە ژیان و ئازاری لەش.
**dysuria** (dis-yoor'i-ə), *n.* باش میز بۆ نەکران؛ بە ئازارەوە میز بۆ کران.

# E e

**E, e** (ē), *n.* (١) تیپی پێنجەمی ئەلفوبێی ئینگلیزی‌یە
(٢) دەنگی ئەم تیپە (٣) پێنجەم لە لیستەیەکدا.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی E, e . (٢) پێنجەم.
**E** (ē), *n.* (١) شتێك کە لە شێوەی تیپی E دا بێت.
(٢) لە ژمێری ڕۆمانیدا بەرامبەری (٢٥٠)یە.
(٣) پێنجەم؛ نمرەی پێنجەم.
**each** (ēch), *adj. & pron.* هەر یەکە؛ هەر یەکێك.
*adv.* یەکی؛ هەر یەکی؛ سەرو *( Give them an apple ~.)* .
**each other,** یەکتری (تەنها بۆ دوو کەس، گیاندار، یا شت)؛ یەکتر.
**eager** (ē′gēr), *adj.* (١) بەپەرۆش؛ بەپەرۆشەوە؛ بەدڵ؛ بەشەوق
(٢) [Archaic]، تیژ.
-**eagerly** *(adv.)*; **eagerness** *(n.)*.
**eagle** (ē′g'l), *n.* (١) سیسارك
(٢) وێنەی سیسارك کە وەك درووشم بەکاربهێنرێت
(٣) دراوێکی کۆنی ئەمەریکی‌یە نرخی دە دۆلارە.
(٤) [-]. ناوی کۆنەستێرەیەکە
**eagle-eyed** (ē′g'l-īd′), *adj.* چاوتیژ
**eaglet** (ē′glit), *n.* بەچکە سیسارك
**ear** (êr), *n.* (١) گوێ؛ گوێچکە (٢) بەشی دەرەوەی گوێ
(٣) هەستی بیستن
(٤) تیژی هەستی بیستن (بەتایبەتی لە جیاوازی کردندا لەبەینی ئاوازدا).
(٥) شتێك کە لە گوێ بکات.
**be all ears,** زۆر بە ووردی یا بە باشی گوێگرتن.
*( I am all ears when you talk.)*
**fall on deaf ears,** گوێ پێ نەدران
*( His warnings fell on deaf ears.)*
**give ( or lend ) ear,** گوێ لێگرتن؛ گوێ پێدان؛ گوێ ڕاهێلان.
**have ( or keep ) an ear to the ground,** گوێ پێدان بە ڕای گشتی.
**have the ear of,** نزیك بوون لە کەسێکەوەو گوێ لێ گیران (دەسەلات).
**in one ear and out the other,** لە گوێیەکەوە چوونەژوورەوەو لە گوێیەکەی ترەوە هاتنەدەرەوە (ئامۆژگاری)؛ بێ کەڵك.
**play by ear,** (١) مۆسیقا لێدان بەبێ نۆتە
(٢) کردنی کارێك یا جووڵانەوەیەك چۆن ڕێکەوت وەها. واتە بەگوێرەی باری ئەو کاتەو بەبێ نەخشەدانان.
**turn a deaf ear,** گوێ نەگرتن (بە دەستەنقەست)؛ گوێ پێ نەدان.

**up to the ears,** ئێجگار؛ یەکجار؛ زۆر.
*( He is in debt up to the ears.)*
**ear** (êr), *n.* گوڵ (شامی، گەنم، جۆ... هتد): *( an ~ of corn.)* .
**earache** (êr′āk′), *n.* گوێ ئێشە.
**eardrop** (êr′drop′), *n.* گوارە؛ ئەڵقەی گوێ.
**ear drops,** دەرمانی گوێ (کە بە دڵۆپ بکرێتە ناو گوێوە).
**eardrum** (êr′drum′), *n.* (١) پەردەی گوێی ناوەڕاست
(٢) گوێی ناوەڕاست.
**eared** (êrd), *adj.* گوێچکەدار: *( long- ~ )* .
**earful** (êr′fool′), *n.* [Colloq.], (١) پڕ گوێ؛ زۆر:
*( I got an ~ of that.)*
(٢) دەنگوباس یا ووت‌ووێژی گرنگ یا سەرسوڕمێنەر.
(٣) سەرزەنشتی.
**earl** (ũrl), *n.* نازناوێکی ئینگلیزی‌یە وەك " ئاغا " یا " بەگ "
**earlap** (êr′lap′), *n.* (١) نەرمە گۆشتی گوێ. (٢) گوێی دەرەوە.
**earldom** (ũrl′dəm), *n.* (١) ناوچەی ژێردەستی ئاغا یا بەگێکی ئینگلیزی. (٢) پلەی ئاغا یا بەگێکی وەها.
**ear lobe,** نەرمە گۆشتی گوێ.
**early** (ũr′li), *adv. & adj.* (١) زوو؛ لە سەرەتای سەردەمێکدا.
(٢) زوو؛ پێش کاتی خۆی (٣) زۆر لە کۆندا. (٤) لە دواڕۆژێکی نزیکدا.
-**earliness** *(n.)*.
**early bird,** [Colloq.], کەسێکە کە زوو دەگاتە شوێنێك یا بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستێ.
**earmark** (êr′märk′), *n.* (١) نیشانە یا داخ کرانێکی گوێی ئاژەڵ بۆ ناسینەوەی. (٢) نیشانە.
*v.t.* (١) نیشانەکردن یا داخ کردنی گوێی ئاژەڵ بۆ ناسینەوەی.
(٢) نیشانەکردن؛ دیاری کردن. (٣) تەرخان کردن یا خستنەلاوە بۆ مەبەستێکی تایبەتی (پارە، ئازووقە... هتد)؛ بۆ دانان (پارە):
*( This money has been ~ed for education.)*
**ear-muffs** (êr′mufs′), *n.pl.* گوێ پۆش (بۆ سەرما).
**earn** (ũrn), *v.t.* (١) دەسکەوتن (پارە)؛ پەیداکردن لە ئەنجامی کۆششدا (پارە): *( to ~ money; to ~ a living)*
(٢) شایستەبوون (پاداشت، سزا)؛ پێ ڕەوا بوون:
*( She ~ed that spanking. ; a well ~ed rest)*
**earnest** (ũr′nist), *adj.* (١) سوور لەسەر؛ بەجۆش؛ دڵسۆز.
(٢) گرنگ: *( ~ matters)* .
-**earnestly** *(adv.)*; **earnestness** *(n.)*.
**in earnest,** بەدڵ؛ بەڕاستی؛ بەڕاست؛ بێ گاڵتە
**earnest** (ũr′nist), *n.* (١) پێشەکی (کڕین و فرۆشتن)؛ بارمتە؛ پارەی دراو (پێشەکی): *( ~ money)* .
(٢) پەیمان؛ بەڵێن
**earnest money,** پارەی پێشەکی (کڕین و فرۆشتن)؛ بارمتە.
**earnings** (ũr′niŋz), *n.pl.* (١) دەسکەوت؛ مووچە (٢) قازانج.
**earphone** (êr′fōn′), *n.* بیستۆك؛ پێ بیست.
**earring** (êr′riŋ′), *n.* گوارە؛ ئەڵقەی گوێ.
**earshot** (êr′shot′), *n.* مەودای بیستنی دەنگی ڕووتی ئادەمیزاد.
**ear-splitting** (êr′split′iŋ), *adj.* گوێ کەڕکەر (دەنگی قایم)؛ زۆر قایم (دەنگ).
**earth** (ũrth), *n.* (١) سەرزەمین؛ جیهان؛ زەوی.
(٢) دانیشتووانی ئەم جیهانە؛ هەموو مرۆڤی سەرزەمین
(٣) زەمین؛ ووشکانی. (٤) [Poetic]، وولات؛ نیشتمان (٥) خاك؛ گڵ؛ خۆڵ.
(٦) [Poetic]، (ا) لەشی مرۆڤ؛ لەش. (ب) کاروباری سەرزەمینی مرۆڤ.
(٧) لانە (گیاندار)؛ کونی گیاندار.
*v.t.* (١) ناشتن (دانەوێڵە، ئەمام، ڕووەك).
(٢) ڕاونانی گیاندارێك بۆ ناو کونەکەی.

*v.i.* خۆشاردنەوە لە کونی ژێرزەمیندا (ڕێوی، گیانداری تر).
**come back (or down ) to earth,** واز لە خەیاڵ پلاوی هێنان؛ بوون بە ڕاستیخواز
**down to earth,** سادە؛ خاکی؛ ڕاستیخواز.
**run to earth,** (۱) ڕاوکردن (۲) دۆزینەوە پاش گەڕانێکی زۆر
**earthborn** (ûrth′bôrn′), *adj.* (۱) سەرزەمینی؛ جیهانی.
(۲) مرۆڤ؛ تاسەر نامێنێ (وەك مرۆڤ).
**earth-bound** (ûrth′bound′), *adj.* (۱) زەمینی؛ بە سەرزەمینو کاروباری سەرزەمینیەوە بەستراوە (۲) بەرەو سەرزەمین هاتوو یا ڕۆیشتوو.
**earthen** (ûr′thən), *adj.* (۱) گڵین؛ قوڕین.
(۲) سەرزەمینی؛ تایبەتی بەم جیهانە نەك بە ئەوەودنیا.
**earthenware** (ûr′thən-wâr′), *n.* دەفری گڵین؛ قاپوقاچاغی گڵین؛ گڵینە
*adj.* گڵین؛ قوڕین
**earthiness** (ûr′thi-nis), *n.* (۱) سادەیی؛ خاکێتی.
(۲) سەرزەمینی.
**earthliness** (ûrth′li-nis), *n.* سەرزەمینێتی؛ تایبەتی بەم جیهانە؛ ئەمەو دنیایەتی.
**earthling** (ûrth′liŋ), *n.* (۱) ئادەمیزاد؛ مرۆڤ؛ مەردوم؛ ئینسان.
(۲) مرۆڤێك کە زۆر خەریکی کاروباری ئەم جیهانە بێتو بەلایەوە گرنگ بێت.
**earthly** (ûrth′li), *adj.* (۱) سەرزەمینی؛ ئەمەودنیایی؛ تایبەتی بە کاروباری سەرزەمین. (۲) لەوانەیە؛ بۆی هەیە.
**earthquake** (ûrth′kwāk′), *n.* بوومەلەرزە
**earthward** (ûrth′wērd), *adj. Also* **earthwards,** بەرەو زەمین
**earthwork** (ûrth′wûrk′), *n.* (۱) سەنگەر؛ بەستو.
(۲) کاری زەوی هەڵکەندنو بەستو یا سەنگەر دروستکردن.
**earthworm** (ûrth′wûrm′), *n.* کرمی ناو خاك؛ کرمی زەوی.
**earthy** (ûr′thi), *adj.* (۱) زەمینی؛ خاکی؛ گڵی.
(۲) تایبەتی بە کاروباری سەرزەمین. (۳) سادە؛ خاکی.
**ear-wax** (êr′waks′), *n.* مۆمی گوێ.
**earwig** (êr′wig′), *n.* (۱) هەزارپێ
(۲) جۆرە مێروویەکە قنگەکەی وەك مقەست وایە.
*v.t.* کارکردنە سەر بە فرووفێڵو بیانوو لە ژێرەوە.
**ease** (ēz), *n.* (۱) ئاسوودەیی؛ خۆشی؛ بێ سەرئێشەییو تەنگوچەڵەمەیی.
(۲) هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ هەڵسانو دانیشتنی سرووشتیو سادە.
(۳) ئاسانی *( He writes with ~ .)*
(٤) خۆش گوزەرانیو ئاسانیو ئاسوودەیی: *( to live a life of ~ )*.
(٥) دەستبەتاڵیو ئاسوودەیی؛ خۆشی.
*v.t.* (۱) دڵنەوایی کردن؛ دڵنەوایی دانەوە؛ دڵخۆش کردن؛ باری شان سووك کردن. (۲) ئازار یا ناخۆشی کەمکردنەوە. (۳) ئاسان کردن؛ ئاسانترکردن.
(٤) (~ **away, down, up, or off**) شل کردنەوە (گرێ، پەت، گوریس)؛ خاوکردنەوە. (٥) دانەواندن وورده وورده؛ بەرە بەرە نزم کردنەوەو دانان:
*( They ~ed the piano into place.)*
*v.i.* (۱) کەم بوونەوە (ئازار، ناخۆشی، توندوتیژی).
(۲) جووڵان یا جووڵاندن وورده وورده
**at ease,** (۱) لە ئاسوودەییدایە؛ لە خۆشیدایە؛ دڵنیا؛ بێباك.
(۲) ڕەحەت کە (فەرمانی سوپا).
**ill at ease,** پەشێو و؛ بێ ئاسوودە؛ ناڕەحەت؛ مەراقدار:
*( He is ill at ease in the company of strangers.)*
**take one's ease,** پێ لێ ڕاکێشانو حەوانەوە.
**easeful** (ēz′fəl), *adj.* پڕ ئاسوودەو خۆشی؛ ڕەحەت؛ ئاسان؛ هێمنو دڵنیا
**easel** (ē′z'l), *n.* سێپای وێنە لەسەر کێشان.
**easement** (ēz′mənt), *n.* (۱) هێمن کردنەوە؛ ئاسوودەیی پێدان؛ کەمکردنەوە (توندوتیژی، ئازار)؛ ئاسان کردن.
(۲) شتێکی ئاسوودەبەخش یا هێمنکەرەوە؛ ئازار یا توندوتیژی کەمکەرەوە؛ ڕەحەتکەر. (۳) مافی پێدابڕۆیشتنی خاوەن زەوییەك بە زەوییەکەی دراوسێیدا (بۆ گەیشتنە زەوییەکەی خۆی).
**easily** (ē′z'l-i, ēz′i-li), *adv.* (۱) بەئاسانی. (۲) بەبێ ئێشو ئازار.
(۳) بێ چەندوچوون: *( She is ~ the best dancer.)*.
(٤) زۆر لەوانەیە: *( The train may ~ be late.)*.
**easiness** (ēz′i-nis), *n.* (۱) ئاسانی. (۲) بێباکی؛ گوێ پێ نەدان.
(۳) هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ ژیری.
**east** (ēst), *n.* (۱) ڕۆژهەلات (۲) ناوچەیەکی ڕۆژهەلاتی
(۳) [E-]، بەشی ڕۆژهەلاتی جیهان (وەك ئاسیا).
*adj.* (۱) ڕۆژهەلاتی؛ تایبەتی بە ڕۆژهەلات؛ بەرەو ڕۆژهەلات؛ ڕووەو ڕۆژهەلات
(۲) لە ڕۆژهەلاتەوە؛ ڕۆژهەلاتی: *( an ~ wind)*.
(۳) [E-]، بەشی ڕۆژهەلاتی کیشوەر، وولات، یا ناوچەیەك:
*( E~ Africa; E~ London)*
*adv.* ڕۆژهەلاتی؛ لە ڕۆژهەلات؛ بەرەو ڕۆژهەلات.
**east-bound** (ēst′bound′), *adj.* بەرەو ڕۆژهەلات دەڕوات
**Easter** (ēs′tēr), *n.* ئیستەر: جەژنی زیندووبوونەوەی عیسا سێ ڕۆژ پاش هەڵواسینی (خاچ پەرستی).
**Easter egg,** هێلکەی ئیستەر: هێلکەیەکی ڕەنگ کراوە بە بۆنەی جەژنی زیندووبوونەوەی عیساوە بۆ جوانی یا دیاری بەکاردەهێنرێت بەتایبەتی بۆ منداڵان.
**easterly** (ēs′tēr-li), *adj.* ڕۆژهەلاتی؛ لە ڕۆژهەلاتەوە دێت:
*( an ~ wind)*
*adv.* (۱) بەرەو ڕۆژهەلات
(۲) لە ڕۆژهەلاتەوە: *( The wind blew ~ . )*.
**eastern** (ēs′tērn), *adj.* (۱) تایبەتی بە ڕۆژهەلات؛ بەرەو ڕۆژهەلات؛ ڕۆژهەلاتی (۲) لە ڕۆژهەلاتەوە هەڵدەکات (با): *( an ~ wind)*
(۳) [E-]، تایبەتی بە ڕۆژهەلاتو گەلو کلتوورو زمانو سرووشتو کۆمەڵی
*n.* کەسێکی ڕۆژهەلاتی؛ ڕۆژهەلاتییەك.
**easterner** (ēs′tēr-nēr), *n.* (۱) کەسێکی ڕۆژهەلاتی؛ ڕۆژهەلاتییەك.
(۲) [E-]، دانیشتوویەکی بەشی ڕۆژهەلاتی ئەمەریکا.
**Eastern Hemisphere,** نیوەی ڕۆژهەلاتی سەرزەمین (کە ئەورووپاو ئاسیاو ئەفەریقاو ئوسترالیا دەگرێتەوە).
**easternmost** (ēs′tērn-mōst′), *adj.* ئەوپەڕی ڕۆژهەلات.
**easting** (ēs′tiŋ), *n.* (۱) ڕۆیشتن یا لادان بەرەو ڕۆژهەلات (کەشتییەوانی). (۲) ئاراستەی ڕۆژهەلات.
(۳) ماوەی لێخوڕین بەرەو ڕۆژهەلات (کەشتییەوانی).
**eastward** (ēst′wērd), *adv. & adj. Also* **eastwards,** بەرەو ڕۆژهەلات.
*n.* ناوچە یا شوێنێکی بەرەو ڕۆژهەلات.
**-eastwardly** *(adv.)*.
**easy** (ēz′i), *adj.* (۱) ئاسان؛ سووك. *( an ~ job)*
(۲) خۆش گوزەران؛ خۆشو ئاسان: *( an ~ life)*.
(۳) نەرمو ڕەحەت (کورسی): *( an ~ chair)*
(٤) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ ژیر: *( ~ manners)*
(٥) هێواش؛ لەسەرخۆ: *( an ~ pace)*.
(٦) دڵنەرم؛ نەرم (مرۆڤ). (۷) بێ بازاڕ (فرۆتەمنی).
(۸) نرخەکەی شلۆقە
(۹) بەئاسانی دەست دەکەوێت بە قازانجێکی کەم (پارە): *( ~ money)*
*adv.* [Colloq.]. بەئاسانی.
**easy come-easy go,** ئەوەی بە ئاسانی دەست کەوێت، بەئاسانیش لەدەست دەچێت.
**on easy street,** خۆش گوزەران
**take it easy,** [Colloq.], (۱) گوێ مەدەرێ؛ ئەوە ناهێنێ؛ خەفەت مەخۆ.
(۲) هێواش!؛ پەلە مەکە!. (۳) خۆت ماندوو مەکە. (ئەم ووتەیە هەندێ جار

لەباتی خواحافیزی بەکاردەهێنرێت).
**easy chair,** کورسی‌یەکی نەرم و ڕەحەت
**easy-going** (ēz′i-gō′iŋ), *adj.* (١) خۆش ڕەوت (ئەسپ).
(٢) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ بەئاسانی لەگەڵدا گونجاو *( an ~ person)* .
**easy mark,** [Colloq.]. کەسێکی ساویلکە کە بەئاسانی بەهەڵەدا ببرێت.
**eat** (ēt), *v.t.* (١) خواردن (٢) ( ~ **away, or up**)، هەڵ لووشین؛
ماشینەوە؛ هەمووی خواردن و هیچ لێ نەهێشتنەوە؛ قوتارکردن.
(٣) خواردنەوە (وەك بە تێزاب)؛ داخوران؛ داڕزان.
*v.i.* خواردن
**eat into,** (١) خواردنەوە (وەك بە تێزاب)؛ داخوران؛ داڕزان
(٢) کنەلێکردن (خواردەمەنی)؛ خواردن و تەواوکردنی هەندێکی.
**eat one's heart out,** [Colloq.], دڵ شەق بردن (لە داخدا یا
لە پەستیدا)؛ دڵ دەرهاتن.
**eat one's words,** پەشیمان بوونەوە لە ووتراوێکی پێشووتر؛
پاشگەزبوونەوە؛ بوون بە قسەی خۆوە.
**eat up,** (١) هەڵ لووشین؛ ماشینەوە؛ قوتارکردن؛ هیچ نەهێشتنەوە.
(٢) بەتەواوی خەریك کردن: *( eaten up with curiosity)* .
**eatable** (ēt′ə-b'l), *adj.* بەکاری خواردن دێت؛ بۆ خواردن دەشێت؛
دەخورێت
*n.pl.* شتێك کە بەکاری خواردن بێت یا بۆ خواردن بشێت؛ خواردەمەنی.
**eaten** (ēt′'n), *past participle of* **eat.**
**eater** (ē′tēr), *n.* کەسێکی زۆرخۆر
**eatery** (ē′tēr-i), *n.* [Colloq.], چێشتخانە (بەتایبەتی هی سادە).
**eating** (ēt′iŋ), *n.* (١) خواردن
(٢) خواردەمەنی؛ شتێك بەکاری خواردن بێت.
**eating-house,** چێشتخانە
**eaves** (ēvz), *n.pl.* گوێ سەبانە؛ گوێ سوانە.
**eavesdrop** (ēvz′drop′), *n.* (١) چۆڕاوگە.
(٢) ئەو شوێنەی چۆڕاوگەی لەسەر دەچۆڕێتەوە.
*v.t.* بە دزی‌یەوە گوێ لە خەڵك گرتن؛ خۆ لێ داگرتن (بۆ قسە دزین):
*( You shouldn't ~ on people.)*
**-eavesdropper** *(n.).*
**ebb** (eb), *n.* (١) نیشتن؛ ئاو نیشتنەوە.
(٢) کزبوون؛ کەم بوونەوە و بەرەو نەمان چوون: *( the ~ of one's hopes)* .
*v.i.* (١) ئاو نیشتنەوە؛ کشانەوەی ئاو (دەریا).
(٢) کزبوون؛ کەم بوونەوە؛ کەمکردن؛ کشانەوە.
**ebb tide,** نیشتاو
**ebon** (eb′ən), *adj. & n.* [Poetic]. = **ebony.**
**ebony** (eb′ən-i), *n.* دارخەیرەزان.
*adj.* (١) لە خەیرەزان دروستکراو (٢) ڕەش.
**ebullience** (i-bul′yəns, i-bul′i-əns), *n.* (١) قلپەقلپدان؛
هەڵچوون (٢) شەوق و شادی؛ بەدەماخی.
**-ebulliency** *(n.).*
**ebullient** (i-bul′yənt, i-bul′i-yənt), *adj.* (١) قلپەقلپدەر
(٢) بە شەوق و شاد؛ بەدەماخ؛ بەکەیف.
**ebullition** (eb′ə-lish′ən), *n.* (١) قلپەقلپدان (٢) شەوق و شادی.
(٣) لەپڕ هەڵچوون (هەست).
**eburnation** (ē′bēr-nā′shən, eb′ēr-nā′shən), *n.* ڕەقبوونی
ئێسقان یا کرکراگە (نەخۆشی).
**ec-** (ek), پێشگرێکە بەمانای بەدەر؛ لە دەرەوەی.
**eccentric** (ik-sen′trik, ek-sen′trik), *adj.* (١) دوو چەقی
جیاوازیان هەیە (بازنە): *( ~ circles)* .
(٢) خولگەکەی لە ناوەڕاستدا نی‌یە: *( an ~ wheel)* .
(٣) زۆر خڕ نی‌یە (٤) نارێك.
(٥) سەیر (مرۆڤ، کردەوە، ڕەووشت)؛ نەشاز؛ سەیرو نەنتیکە.
*n.* (١) بازنەیەکی چەق جیاواز لەگەڵ بازنەیەکی تەنیشتیدا.
(٢) کەسێکی سەیر؛ کەسێکی نەشاز.
**-eccentrically** *(adv.).*
**eccentricity** (ek′sən-tris′ə-ti), *n.* (١) جیاوازی چەقی دوو بازنە.
(٢) تەواو خڕ نەبوون (٣) سەیری (ڕەفتار، کردەوە)؛ سەیری و نەنتیکەیی؛
نەشازی؛ جیاوازی ڕەفتارو کردەوە.
**ecclesia** (i-klē′zhi-ə, i-klē′zi-ə), *n.* (١) کۆڕی گەل (بۆ مەبەستی
ڕامیاری لە یۆنانی کۆندا) (٢) ئەندامی کڵێسەیەك.
(٣) خانووی کڵێسەیەك.
**ecclesiastic** (i-klē′zi-as′tik), *adj.* تایبەتی بە کڵێسە و ڕێکخراوی
کڵێسە و قەشەکان.
*n.* قەشە.
**ecclesiastical** (i-klē′zi-as′ti-k'l), *adj.* تایبەتی بە کڵێسە و
ڕێکخراوی کڵێسە و قەشەکان
**ecclesiasticism** (i-klē′zi-as′tə-siz'm), *n.* (١) نەریت و بەند و
باو و دەستووری کڵێسە و ڕێکخراوەکانی. (٢) سووربوون لەسەر ئەم نەریت و
بەند و باو و دەستوورانە
**ecdysis** (ek′di-sis), *n.* کاژ یا پێست فڕێدان (مار و مێروو).
**echelon** (esh′ə-lon′), *n.* (١) ڕیز یا پۆلی هاوڕێکی سەرباز، فڕۆکە،
یا کەشتی کە ئەمسەرو ئەو سەرەکەیان ڕێك نەبن و وەك پێ پلیکانە بنوێنن.
(٢) پۆلی سەرباز: *( an assault ~ )* .
(٣) چین (فەرمانگە، ڕێکخراو، فەرمانڕەوایی):
*( the highest ~ of a government or an organization)*
*v.t. & v.i.* ڕیزکردن (سەرباز، فڕۆکە، کەشتی)؛ ڕیزبوون؛ پۆل پۆل کردن.
**echo** (ek′ō), *n.* (١) دەنگدانەوە. (٢) دەنگێکی وەها.
(٣) دووپاتکردنەوە یا لاساییکردنەوە (ووتە، خوو، بیروباوەڕ)؛
بۆ سەندنەوە (گۆرانی، دەنگ، ووتە). (٤) لاساییکەرەوە؛ دووپاتکەرەوە.
(٥) وەڵامێکی باش یا بەدڵ بوو
*v.i.* (١) دەنگدانەوە. *( The empty room ~ed.)* .
(٢) دووبارەبوونەوە؛ گەڕانەوە (دەنگ)؛ دانەوە (دەنگ):
*( His voice ~ed in the hall.)*
*v.t.* (١) لاساییکردنەوە (دەنگ، ووتە، خوو، بیروباوەڕ)؛ دووپاتکردنەوە.
(٢) دەنگدانەوە.
**echoic** (e-kō′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە دەنگدانەوە
(٢) تایبەتی بە ووشەیەك کە ماناکەی و دەنگەکەی لەیەك دەچن.
**echoism** (ek′ō-iz'm), *n.* لەیەکچوونی مانای ووشەیەك و دەنگەکەی.
**éclair** (ā-klâr′, i-klâr′), *n.* جۆرە شیرینی‌یەکی لاکێشەیی‌یە لە پاقلاوە
گەورەترە ناوەکەی کاستەری تێدایە.
**éclat** (ā-klä′, i-klä′), *n.* (١) لێهاتنێکی لە ڕادە بەدەر؛ بلیمەتی
(٢) سەرکەوتن (٣) (ا) ناوبانگ؛ ناوداری.
(ب) ناوخراپی؛ بەدناوی؛ ناو بەخراپ دەرچوون.
**eclectic** (ik-lek′tik, ek-lek′tik), *adj.* (١) هەڵبژێر لە سەرچاوە و
ڕێبازی جیا جیا *( an ~ person)* (٢) هەمەچەشن؛ هەمەڕەنگ
*n.* کەسێك کە تەنها لەسەر یەك ڕێباز ناڕوات، بەڵکو ئەو بیروڕایانەی بەدڵی بێت
لەگەڵێك سەرچاوە و ڕێبازەوە وەری دەگرێت و لەسەری دەڕوات.
**-eclectically** *(adv.).*
**eclecticism** (ik-lek′tə-siz'm, ek-lek′tə-siz'm), *n.* وەرگرتن
یا هەڵبژاردنی باشترین بیروڕا لە گەڵێك سەرچاوە و ڕێبازەوە و لەسەری ڕۆیشتن
**eclipse** (i-klips′), *n.* (١) (ا) ڕۆژ گیران *( solar ~ )* .
(ب) مانگ گیران: *( lunar ~ )* .
(٢) ڕووناکی لێ بڕان؛ بەری ڕووناکی لێ بڕان؛ تاریك بوون
(٣) دیارنەبوونێکی سەردەمی (ناوبانگ)؛ کردن بە ژێرەوە، لەبیرچوونەوە. یا
داپۆشینێکی سەردەمی ناوبانگی مرۆڤ، ڕێکخراو... هتد.
*v.t.* (١) ڕۆژ گیران؛ مانگ گیران؛ ڕۆژ گرتن؛ مانگ گرتن؛ تاریك کردن؛ داپۆشین.
(٢) کردن بە ژێرەوە؛ داپۆشین؛ لەبیربردنەوە (ناو، ناوبانگ):

***( Shakespeare ~d his rivals in the drama.)***
**-ecliptic** ***(adj.)*; ecliptical *(adj.).***
**eclogue** (ek′lôg, ek′log), ***n.*** هەلبەستێکی لادێیانە لەشێوەی گفتوگۆ لەنێوان دوو شوانەدا؛ هەلبەستێکە دەربارەی ژیانی شوان و لادێ بەشێوەی گفتوگۆ.
**ecology** (ē-kol′ə-ji), ***n.*** (١) زانستی پەیوەندی نێوان گیاندارو شوێنەوارەکەی (زیندەوەرزانی). (٢) زانستی پەیوەندی نێوان دابەشبوونی مرۆڤ و زۆرو کەمی سامانی سرووشتی و ئەنجامەکانی لەسەر کۆمەل (کۆمەلناسی). (٣) سرووشت پاراستن؛ زانستی شوێنەوار پاراستن؛ شوێنەوارزانی
**economic** (ē′kə-nom′ik, ek′ə-nom′ik), ***adj.*** (١) ئابووری؛ تایبەتی بە ئابووری. (٢) تایبەتی بە بەرهەمهێنان و دابەشکردنی شتومەك. (٣) تایبەتی بە پێویستی مرۆڤ بۆ شتومەك
**economical** (ē′kə-nom′i-k'l, ek′ə-nom′i-k'l), ***adj.*** (١) پاشەکەوتکەر؛ بەفیڕۆنەدەر؛ هەرزان؛ هەرزانبەها
***( an ~ person; an ~ store)***
(٢) ئابووری؛ تایبەتی بە ئابووری یا زانستی ئابووری.
**economically** (ē′kə-nom′i-k'l-i), ***adv.*** (١) بەبێ بەفیڕۆدان؛ بە دەست بە خۆوە گرتن و پاشەکەوت کردن. ***( He lives ~ .)***
(٢) لەڕووی ئابوورییەوە؛ لە باری ئابوورییەوە
**economics** (ē′kə-nom′iks, ek′ə-nom′iks), ***n.pl.*** زانستی ئابووری.
**economist** (i-kon′ə-mist, ē-kon′ə-mist), ***n.*** زانای ئابووری؛ ئابووریزان؛ ئابووریناس.
**economize** (i-kon′ə-mīz′, ē-kon′ə-mīz′), ***v.i. & v.t.*** دەست بە خۆوە گرتن؛ دەست بە پارە یا شتی ترەوە گرتن؛ پاشەکەوت کردن؛ بەفیڕۆ نەدان:
***( He ~d by taking a bus to work instead of a taxi.)***
**-economizer** ***(n.).***
**economy** (i-kon′ə-mi, ē-kon′ə-mi), ***n.*** (١) ئابووری؛ سیستمی ئابووری. (٢) پاشەکەوت کردن؛ دەست پێوەگرتن؛ بەفیڕۆ نەدان. (٣) بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری مال، ڕێکخراو، بازرگانی، فەرمانڕەوایی. (٤) ڕێك و پێکی
**ecstasy** (ek′stə-si), ***n.*** (١) گەشکە؛ گەشکەگرتن؛ شادی؛ شادمانی؛ ئەوپەڕی خۆشی و کامەرانی؛ شەیدایی. (٢) حال لێ هاتن (ئاین، دەروێش).
**ecstatic** (ik-stat′ik, ek-stat′ik), ***adj.*** (١) گەشکەدار؛ شەیدا؛ پڕ لە شادی؛ شێت و شەیدا. (٢) حال لێ هاتوو
***n.*** کەسێکی شێت و شەیدا؛ کەسێك کە شەیدا دەبێت بە شتێك، ڕووداوێك، یـ کەسێك
**-ecstatically** ***(adv.).***
**ecto-** (ek′tō, ek′tə), پێشگرێکە بەمانای هی دەرەوە؛ دەرەکی.
**ectoderm** (ek′tə-dŭrm′), ***n.*** توێی دەرەوەی پێستی شانەی ئاژەلەی گیاندار.
**-ectodermal** ***(adj.)*; ectodermic *(adj.).***
**-ectomy** (ek′tə-mi), پاشگرێکە بەمانای: بڕین یا لێکردنەوەو لابردن بە نەشتەرکاری ***( appendectomy, tonsillectomy)*** .
**ectoplasm** (ek′tə-plaz′m), ***n.*** توێی دەرەوەی " سایتۆپلازم " ی شانەی لەش.
**ectype** (ek′tīp′), ***n.*** وێنە؛ وێنەی دەقاودەق
**ecumenical** (ek′yoo-men′i-k'l), ***adj.*** گشتی (خاچ پەرستی)؛ هەمووبی؛ جیهانی
**eczema** (ek′sə-mə, eg′zi-mə), ***n.*** میزۆ؛ ئەکزیما.
**-eczematous** ***(adj.).***
**-ed** (id, əd, d, t), (١) نیشانەی سەردەمی ڕابوردووی کردارە:
***( played, walked, wanted, etc.)***

(٢) ئاوەلناوی پێ دروست دەکرێت لە ناو یا کردار: ***( cultured, versed)*** .
(٣) پاشگرێکە دەنرێتە پال ناو بۆ مانای " بوون " یا " هەیەتی " :
***( bearded, sugared, small-mouthed)***
**edacity** (i-das′ə-ti), ***n.*** زۆر حەز لە خواردن کردن؛ زۆر خواردن؛ هەل لووشین.
**-edacious** ***(adj.).***
**eddy** (ed′i), ***n.*** گێژاو؛ گەرداو؛ گەردەلوول؛ گێژەلووکە.
***v.i.*** خولانەوە بە پێچەوانەی تەووژمی سەرەکی؛ خول خواردن
**edema** (i-dē′mə), ***n.*** ئاوبەند؛ ئاوبەنگ؛ شلە تێدا کۆبوونەوەو ئاوسان (پزیشکەوانی).
**-edematose** ***(adj.)*; edematous *(adj.).***
**Eden** (ē′d'n), ***n.*** (١) باخچەی عەدەن؛ بەهەشتی عەدەن (کە نیشتەجێی ئادەم و حەوا بوو). (٢) بەهەشت؛ شوێنێکی زۆر خۆش.
**edentate** (ē-den′tāt, i-den′tāt), ***adj.*** بێ ددان (گیاندار).
***n.*** چەند جۆرە گیاندارێکی شیردەری بێ ددانە.
**edge** (ej), ***n.*** (١) دەمی تیغێك (چەقۆ، شیر، داس، تەور).
(٢) تیژی.
(٣) قەراغ؛ پەراوێز؛ کوێ (کەندەلان)؛ لێوار؛ کەنار؛ ڕۆخ:
***( the ~ of a cliff)***
(٤) چەك.
(٥) [Colloq.]، باشتری؛ باشتربوون (توانا، لێهاتوویی، مەودای ملەملێ):
***( You have the ~ on me.)***
***v.t.*** (١) لێوار پێوەنان یا بۆ کردن؛ پەراوێز بۆ دروستکردن.
(٢) لابەلایی ڕۆیشتن (وەك بەناو کۆمەلێك خەلکدا)؛ ڕێی خۆ کردنەوە بەلابەلایی
(٣) لەسەرخۆو بە وریایی بۆ پێشەوە ڕۆیشتن.
***v.i.*** (١) لابەلایی ڕۆیشتن.
(٢) لێ دوورکەوتنەوە بەهێواشی و بە وریایی:
***( She ~d away from the fierce-looking dog.)***
**on edge,** (١) زوو تووڕە دەبێت؛ بەئاسانی زووهەلچوو (مرۆڤ)؛ تەنگەجیکلانە؛ تەنگەتیلکە: ***( He is on edge today.)***
(٢) بەپەرۆش؛ بێ ئارام.
**set one's teeth on edge,** (١) مووچرکە بە ددانەدا هاتن یا هێنان.
(٢) پەستکردن؛ تووڕەکردن.
**take the edge off,** لە توندوتیژی کەمکردنەوە (خۆشی، ناخۆشی)؛ لێ کەمکردنەوە (پلەی خۆشی یا ناخۆشی).
**edge tool,** ئەسکەنە یا تیغێکی دەم تیژ.
**edgeways** (ej′wāz′), ***adv.*** دەم بە دەمەوە (تیغ)؛ بەرەو دەمەکەی (تیغ).
**get a word in edgeways,** بواری دەم کردنەوە بوون لەکاتی دانیشتن لەگەل کەسێك یا چەند کەسێکی زۆرووێژدا.
**edging** (ej′iŋ), ***n.*** پەراوێز؛ شیرازە؛ تیلماسکی قەراغ.
**edgy** (ej′i), ***adj.*** (١) تیژ (تیغ).
(٢) تەنگەجیکلانە؛ تەنگەتیلکە؛ زووهەلچوو؛ زوو تووڕە دەبێت
**edible** (ed′ə-b'l), ***adj.*** بەکاری خواردن دێت؛ بۆ خواردن شیاو؛ بۆ خواردن دەشێت.
***n.pl.*** خواردەمەنی
**-edibility** ***(n.).***
**edict** (ē′dikt), ***n.*** فەرمان؛ فەرمانی میری، شاهانە، یا سەرکۆمارانە.
**edification** (ed′ə-fi-kā′shən), ***n.*** ڕەووشتی جوان و باش فێرکردن؛ ڕەووشت باش کردن؛ پوختەکاری ڕەووشت
**edifice** (ed′ə-fis), ***n.*** خانوویەکی گەورە.
**edify** (ed′ə-fī′), ***v.t.*** (١) ڕەووشتی جوان و باش فێرکردن؛ فێری ڕەفتاری جوان کردن؛ خستنەسەر ڕێگەی ڕاست؛ ڕەووشت دادان
(٢) [Archaic]، دامەزراندن؛ دروستکردن.
**-edifier** ***(n.).***
**edit** (ed′it), ***v.t.*** (١) ئامادەکردن و پوختەکردن بۆ بلاوکردنەوە (پەرتووك،

گۆڤار، نامە). (٢) بژارکردن؛ هەڵە چاك کردن؛ هەڵەبڕکردن.
(٣) سەرپەرشتی کردنی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك یا گۆڤارێك.

**edition** (i-dish'ən), ***n.*** (١) شێوەو قەبارەی پەرتووکێکی لەچاپدراو؛ چاپ. ( *a pocket* ~ )
(٢) (أ) سەرجەمی پەرتووك، ڕۆژنامە، یا گۆڤاری لەچاپدراو لەسەر هەمان قاڵب لە هەمان کاتدا. (ب) دانەیەك لەم پەرتووك، گۆڤار، یا ڕۆژنامەیە.
(٣) جایێکی تایبەتی؛ لەچاپدراوێکی تایبەتی.

**editor** (ed'i-tēr), ***n.*** (١) نووسەر (ڕۆژنامە، گۆڤار)؛ سەرنووسەر (گۆڤار، ڕۆژنامە)؛ بژارکەر. (٢) نووسەری سەرووتاری ڕۆژنامەیەك.
(٣) ئامێری بژارکردن و پوختەکردن و ئامادەکردنی فیلمی سینەمایی.

**editorial** (ed'ə-tôr'i-əl, ed'ə-tō'ri-əl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە بژارکەر یا بژارکردن. (٢) ڕای خۆ دەربڕین؛ ڕا دەربڕ.
( *E~ comment has no place in news stories.* )
***n.*** سەرووتار (ڕۆژنامە)؛ ڕاووتار.

-**editorially** *(adv.).*

**editorialize** (ed'tôr'i-əl-īz', ed'tō'ri-əl-īz'), ***v.t. & v.i.*** ڕای خۆ دەربڕین (بەتایبەتی نووسەر یا خاوەنی ڕۆژنامە)؛ تێبینی خۆ بە دەنگوباس یا شتی ترەوە نان.

-**editorialization** *(n.)*; **editorializer** *(n.).*

**editorial staff,** دەستەی نووسەران (ڕۆژنامە، گۆڤار).

**editor in chief,** سەرنووسەر؛ سەرنووسەران (ڕۆژنامە).

**editorship** (ed'i-tēr-ship'), ***n.*** سەرنووسەرێتی؛ پلەو دەسەڵاتو کاروباری سەرنووسەر یا نووسەر.

**educable** (ej'oo-kə-b'l), ***adj.*** فێردەکرێت؛ پەروەردە دەکرێت.

**educate** (ej'oo-kāt'), ***v.t.*** (١) پەروەردەکردن (خوێندکاران)؛ فێرکردن.
(٢) خستنە قوتابخانە (یا بەر خوێندن)و ئەرکی دارایی کێشان.

**educated** (ej'oo-kā'tid), ***adj.*** ڕۆشنبیر؛ خوێندەوار؛ زانا.

**education** (ej'oo-kā'shən), ***n.*** (١) پەروەردەکردن؛ فێرکردن؛ خوێندن؛ پەروەردەو فێرکردن. (٢) زانیاری پەروەردەو فێرکردن.
(٣) ڕۆشنبیری؛ خوێندەواری. (٤) زانست؛ زانیاری؛ فەرهەنگ.

**educational** (ej'oo-kā'shən-'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە پەروەردەو فێرکردن؛ تایبەتی بە خوێندەواری؛ ڕۆشنبیرێتی.
(٢) فێرکەر؛ پەروەردەکەر؛ چاوکەرەوە. ( *an ~ film* )

-**educationally** *(adv.).*

**educationist** (ej'oo-kā'shən-ist), ***n.*** زانای پەروەردەو فێرکردن.

**educative** (ej'oo-kā'tiv), ***adj.*** فێرکەر؛ چاوکەرەوە؛ بەکەڵك (لەڕووی پەروەردەو فێرکردنەوە).

**educator** (ej'oo-kā'tēr), ***n.*** (١) مامۆستا؛ پەروەردەکەر؛ فێرکەر؛ پەروەردەکار. (٢) زانای پەروەردەو فێرکردن.

**educe** (i-dōōs', ē-dūs'), ***v.t.*** (١) لێ دەرهێنان؛ لێ وەرگرتن.
(٢) بۆدەرکەوتن؛ هەڵهێنان.

-**educible** *(adj.)*; **eduction** *(n.).*

**eel** (ēl), ***n.*** مارماسی؛ ماری ئاوی.

**e'en** (ēn), ***adv.*** [Poetic], = even.
***n.*** [Dial or Poetic], = even = evening.

**e'er** (âr), ***adv.*** [Poetic], = ever.

-**eer** (ēr), پاشگرێکە بەمانای: (١) کەسێکی پەیوەندە پێوەبوو:
( *auctioneer, engineer* )
(٢) بکەر؛ نووسەر؛ دروستکەر: ( *pamphleteer, sonneteer, profiteer* )

**eerie, eery** (êr'i, ē'ri), ***adj.*** ترسناك؛ ناناساو ناخۆش و سەیرو ترسناك: ( *A graveyard is an ~ place.* )

-**eerily** *(adv.)*; **eeriness** *(n.).*

**efface** (i-fās', e-fās'), ***v.t.*** (١) سڕینەوە؛ نەهێشتن:
( *It seemed that the very memory of her was ~ed from his mind.* )
(٢) خۆکشانەوە؛ خۆدەرنەخستن.

-**effacement** *(n.).*

**effect** (ə-fekt', i-fekt'), ***n.*** (١) ئەنجام. (٢) کاریگەری.
(٣) کارتێکردن؛ کار: ( *The drug had no ~ on him.* )
(٤) مانا؛ مەبەست: ( *He spoke to this ~.* )
(٥) سەرنج ڕاکێشان بە خۆنواندن: ( *She did that just for ~.* )
(٦) *(pl.)* کەلوپەلی تایبەت بە کەسێك؛ شتومەکی خۆیی:
( *personal ~s ; household ~s* )
***v.t.*** (١) هێنانە ئەنجام؛ بە ئەنجام گەیاندن؛ بوون بە هۆ؛ هێنانە دی.
(٢) کردن؛ دروستکردن؛ دامەزراندن.

for effect, بۆ خۆنواندن و سەرنج ڕاکێشان؛ بۆ کارکردنە سەر خەڵك.
give effect to, خستنەکار؛ کارپێکردن.
in effect, (١) لەڕاستیدا؛ ئەوە دەگرێتەوە لەڕاستیدا.
(٢) لەکاردایە؛ کاری پێ دەکرێت (یاساو پەیڕەو).
of no effect, بێ سوود؛ بێ ئەنجام؛ بێ بەرهەم؛ بێ کەڵك.
put into effect, کارپێکردن (یاسا، پەیڕەو)؛ خستنەکار.
take effect, دەستپێکردن؛ دەست بە ئەنجامدان کردن؛ کەوتنەکار:
( *The new law will take effect immediately.* )
to the effect, بەو مەبەستە؛ بەو مانایە؛ بەو نیازە.

**effective** (ə-fek'tiv, i-fek'tiv), ***adj.*** (١) کاریگەر؛ بەکار؛ بەئەنجام. (٢) لەکاردایە؛ کارکەر؛ خراوەتە کار؛ کارپێکراو.
(٣) چەکدارو ئامادە بۆ جەنگ (کەشتی، سەرباز).
***n.pl.*** سەربازی چەکدارو ئامادە بۆ جەنگ.

-**effectiveness** *(n.).*

**effectual** (ə-fek'chōō-əl, i-fek'chōō-əl), ***adj.*** (١) بەئەنجام؛ ئەنجامدار؛ ئەنجامدەر؛ کاریگەر؛ بەکار. (٢) دروست؛ کارپێکراو.

**effectuate** (ə-fek'chōō-āt', i-fek'chōō-āt'), ***v.t.*** هێنانەدی؛ بەئەنجام گەیاندن؛ بوون بەهۆی ڕوودان.

-**effectuation** *(n.).*

**effeminate** (ə-fem'ə-nit, i-fem'ə-nit), ***adj.*** سەرژنانی؛ ژنانی؛ سەرژنانە؛ کچانی.

-**effeminacy** *(n.).*

**efferent** (ef'ēr-ənt), ***adj.*** خوێنبەر (دەمار).
***n.*** (١) جۆگەی ئاوبەر لە ئەستێڵێکەوە.
(٢) دەماری خوێنبەر.

**effervesce** (ef'ēr-ves'), ***v.i.*** (١) گاز لێ هاتنەدەرەوە (خواردنەوەی گازاوی وەك کۆکاکۆلا)؛ بڵقەبڵق کردن.
(٢) شەوق و شادی پیشاندان؛ بەکەیف بوون؛ بەجۆش بوون (مرۆڤ).

**effervescence** (ef'ēr-ves''ns), ***n.*** (١) بڵقەبڵق کردن؛ کەف کردن؛ گاز لێ هاتنەدەرەوە (خواردنەوە). (٢) شەوق و شادی؛ جۆش وخرۆش.

**effervescent** (ef'ēr-ves''nt), ***adj.*** (١) بڵقەبڵقکەر؛ کەف لێ هەڵچوو؛ گاز لێ هاتەدەرەوە. (٢) بەشەوق و شاد؛ بەکەیف؛ بەدەماخ؛ بەجۆش وخرۆش.

**effete** (e-fēt', i-fēt'), ***adj.*** زیر (لەبەر پیری)؛ توانای بەرگرتن نەماو؛ بێ بەر؛ بەرنەگرتوو (لەبەر پیری و پووکانەوە)؛ هێلکە پێ نەماو (مەجان).

-**effeteness** *(n.).*

**efficacious** (ef'ə-kā'shəs), ***adj.*** بەکار؛ بەئەنجام؛ کاریگەر؛ باش:
( *an ~ drug* )

**efficacy** (ef'i-kə-si), ***n.*** کاریگەری؛ کاریگەرێتی؛ بەکاری.

**efficiency** (ə-fish'ən-si, i-fish'ən-si), ***n.*** (١) کاریگەرێتی؛ کاریگەری؛ بەکاری. (٢) کارامەیی؛ لێهاتوویی؛ کارگوزاری؛ کارگوزارێتی.

**efficient** (ə-fish'ənt, i-fish'ənt), ***adj.*** (١) کاریگەر؛ بەکار:
( *an ~ method* )
(٢) کارگوزار؛ کارامە؛ چالاك؛ لێهاتوو: ( *an ~ worker* )

**effigy** (ef'ə-ji), ***n.*** وێنە یا پەیکەری شێوەی دوژمنێك (بۆ سووتاندن یا هەڵواسین).

**burn ( or hang ) in effigy,** وێنەی ناحەز یا دوژمن سووتاندن یا هەڵواسین لە ڕقدا.

**effloresce** (ef'lô-res', if'lō-res'), *v.i.* (١) گەشانەوە (گوڵ)؛ گوڵ گرتن. (٢) بوون بە تۆز لە بلوورە (کیمیا)؛ پرووان.

-**efflorescence** *(n.)*; **efflorescent** *(adj.)*.

**effluence** (ef'lōō-əns), *n.* (١) لێوە هاتنەدەرەوە بە تەووژم (ئاو، ئاگر، ڕووناکی). (٢) شتێکی لێوە هاتەدەرەوە بە تەووژم.

-**effluent** *(adj.)*.

**effort** (ef'ērt), *n.* (١) کۆشش؛ هەوڵ؛ هەوڵدان؛ ڕەنج؛ ئەرك؛ تەقەلا. (٢) بەرهەم؛ بەر؛ ئەنجامی کۆشش؛ دەسکەوت.

**effortless** (ef'ērt-lis), *adj.* ئاسان؛ سووك و ئاسان؛ کۆشش نەویست.

**effrontery** (e-frun'tēr-i, i-frun-tēr-i), *n.* بێ حەیایی؛ بێ شەرمی؛ چەقاوەسوویی؛ چاوقایمی و بێ ئابڕوویی.

**effulge** (e-fulj', i-fulj'), *v.i.* درەوشانەوە.

**effulgence** (e-ful'jəns, i-ful'jəns), *n.* درەوشانەوە.

-**effulgent** *(adj.)*.

**effuse** (e-fūz', i-fūz'), *v.t. & v.i.* (١) تێڕژان؛ لێ ڕژان؛ دەرهاویشتن؛ لێ دەرهاتن بە تەووژم؛ لەبەر ڕۆیشتن. (٢) بڵاوکردنەوە.

*adj.* بڵاو؛ شاش.

**effusion** (e-fū'zhən, i-fū'zhən), *n.* (١) لێ ڕژان؛ دەرهاویشتن؛ لێ هاتنەدەرەوە بە تەووژم. (٢) هەست دەربڕینێکی لە ڕادە بەدەر (بەتایبەتی هەستی چاك). (٣) خوێن لێهاتن؛ شلە دەردان (لوو).

**effusive** (e-fū'siv, i-fū'siv), *adj.* (١) لێ ڕژان؛ پڕ؛ دەرهاویشت. (٢) هەست دەربڕ بەشێوەیەکی لە ڕادە بەدەر (بەتایبەتی ڕێزلێنان و سوپاس کردن)؛ ڕێزلێنەر یا سوپاسکەری لە ڕادە بەدەر:

*( ~ thanks; to be ~ in one's gratitude)*

**eft** (eft), *n.* مارمێلکەیەکی بچووك.

**eft** (eft), *adv.* (١) [Archaic]، دیسانەوە؛ دیسان. (٢) لەدواییدا.

**eftsoon** (eft-sōōn'), *adv.* (١) [Archaic]، یەکسەر؛ دەستبەجێ. (٢) زوو زوو. (٣) دیسانەوە؛ دیسان.

**e.g.,** *exempli gratia,* بۆ نموونە؛ بۆ وێنە.

**egalitarian** (i-gal'ə-târ'i-ən, ē-gal'ə-târ'i-ən), *adj. & n.* یەکسانیخواز لەنێوان هەموو ئادەمیزددا.

-**egalitarianism** *(n.)*.

**egest** (ē-jest'), *v.t.* کردن یا دەرهاویشتن (عەرەق، پیسایی).

-**egestion** *(n.)*; **egestive** *(adj.)*.

**egg** (eg), *n.* (١) هێلکە. (٢) گەرا. (٣) [Slang]، کەس؛ مرۆڤ *( He's a good ~ .)*. (٤) [Slang]، بۆمبا؛ نارنجۆك.

*v.t.* (١) هێلکە تێکردن؛ لەگەڵ هێلکە تێکەڵاوکردن. (٢) [Colloq.]، هێلکە تێگرتن؛ هێلکە پیادان؛ هێلکە پیاکێشان.

**a bad egg,** [Colloq.], کەسێکی بێ نرخ و ناپاك.

**in the egg,** لەسەرەتادا؛ لەسەرەتاوە.

**put ( or have ) all one's eggs in one basket,** پشت بەستن تەنها بە یەك ڕێباز، کەس، کۆمپانیا، یا شتەوە و دواڕۆژی خۆ پێوەبەستن.

**egg** (eg), *v.t.* ( ~ on ), هاندان

**egg-head** (eg'hed'), *n.* [Slang]. ڕۆشنبیر یا خوێندەوار (لەڕووی سووکییەوە).

**egg-nog** (eg'nog'), *n.* جۆرە خواردنەوەیەکە لە هێلکە و شیر و شەکر و ویسکی دروست دەکرێت.

**eggplant** (eg'plant', eg'plänt'), *n.* باینجان؛ باینجانە ڕەشە.

**eggshell** (eg'shel'), *n.* توێکڵی هێلکە؛ قاوغی هێلکە.

*adj.* (١) ناسك. (٢) سپییەکی زەردباو.

**egis** (ē'jis), *n. Also* aegis, (١) قەڵغان (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) پاراستن؛ چاودێری.

**ego** (ē'gō, eg'ō), *n.* (١) خۆ؛ گیان؛ من. (٢) [Colloq.]، لووت بەرزی؛ خۆپەسەندی؛ لەخۆباییتی

**egocentric** (ē'gō-sen'trik, eg'ō-sen'trik), *adj.* خۆپەرست؛ خۆ خۆشەویست؛ خۆویست.

*n.* کەسێکی خۆپەرست یا خۆویست.

-**egocentricity** *(n.)*.

**egoism** (ē'gō-iz'm, eg'ō-iz'm), *n.* (١) خۆویستەنی؛ خۆویستی؛ من منۆکێ؛ خۆپەرستی. (٢) لووت بەرزی؛ لەخۆبایی.

**egoist** (ē'gō-ist, eg'ō-ist), *n.* (١) کەسێکی خۆپەرست یا خۆویست. (٢) کەسێکی لووت بەرز یا لەخۆبایی.

-**egoistic** *(adj.)*; **egoistical** *(adj.)*.

**egomania** (ē'gō-mā'ni-ə, eg'ō-mā'ni-ə), *n.* خۆپەرستی یا خۆپەسەندی لە ڕادە بەدەر.

**egomaniac** (ē'gō-mā'ni-ak', eg'ō-mā'ni-ak'), *n.* کەسێکی لە ڕادە بەدەر خۆپەرست.

**egotism** (ē'gə-tiz'm, eg'ə-tiz'm), *n.* (١) خۆپەرستی؛ خۆویستی؛ خۆپەسەندی. (٢) لووت بەرزی؛ لەخۆباییتی.

**egotist** (ē'gə-tist, eg'ə-tist), *n.* (١) کەسێکی خۆپەرست، خۆویست، یا خۆپەسەند. (٢) کەسێکی لەخۆبایی یا لووت بەرز.

-**egotistic** *(adj.)*; **egotistical** *(adj.)*.

**egregious** (i-grē'jəs, i-grē'ji-əs), *adj.* زۆر خراپ؛ بەد؛ بێ شەرم؛ هەڵماڵراو: *( an ~ mistake, liar, etc.)*.

**egress** (ē'gres), *n.* (١) چوونەدەرەوە؛ هاتنەدەرەوە. (٢) مافی چوونەدەرەوە. (٣) دەرگا؛ جێی چوونەدەرەوە.

-**egression** *(n.)*.

**egret** (ē'grit, eg'ret), *n.* (١) باڵندەیەکی وەك شینە شاهۆیە لە نزیك زۆنگاودا دەژی پەڕی پشت و کلکی جوانە. (٢) دەسکێك لە پەڕی ئەم باڵندەیە (بۆ جوانی و ڕازاندنەوە).

**Egypt** (ē'jipt), *n.* میسر.

**Egyptian** (i-jip'shən, ē-jip'shən), *adj.* (١) میسری (گەل، کلتوور). (٢) تایبەتی بە زمانی میسری. (٣) [Obs.]، قەرەج.

*n.* (١) میسری؛ میسرییەك. (٢) زمانی میسری کۆن. (٣) [Obs.] قەرەجێك.

**Egyptology** (ē'jip-tol'ə-ji), *n.* زانستی لێکۆڵینەوەی شوێنەوارو خانووسازی و زمان و نووسراوەکانی کۆنی میسر.

-**Egyptologist** *(n.)*.

**eh** (ā, e), *interj.* دەنگێکە ئەم مانایانە دەردەبڕێت: (١) سەرسامی. (٢) گومان؛ ها؟؛ وتت چی؟؛ وانییە؟.

**eight** (āt), *adj. & n.* (١) هەشت. (٢) تاقمێکی هەشتی.

**eight ball,** لە یاری بلیارددا تۆپێکی ڕەشە ژمارە هەشتی لەسەرە (ئەگەر یاریکەر ئەم تۆپە بخاتە ناوەوە پێش تۆپەکانی تر یارییەکە دەدۆڕێنێت).

**behind the eight ball,** [Slang], لە بارێکی ناپەسەند یا خراپدایە.

**eighteen** (ā'tēn'), *adj. & n.* هەژدە.

**eighteenth** (ā'tēnth'), *adj. & n.* (١) هەژدەهەم؛ هەژدەیەم. (٢) هەژدەیەك؛ بەشێك لە هەژدە بەش.

**eightfold** (āt'fōld'), *adj. & adv.* هەشت ئەوەندە.

**eighth** (ātth, āth), *adj. & n.* (١) هەشتەم. (٢) هەشت یەك؛ بەشێك لە هەشت بەش.

**eightieth** (ā'ti-ith), *adj. & n.* (١) هەشتاهەمین؛ هەشتایەم. (٢) هەشتایەك؛ بەشێك لە هەشتا بەش.

**eighty** (ā'ti), *adj. & n.* هەشتا.

**the eighties,** هەشتاکان: ساڵانی نێوان هەشتا و نەوەد (لە سەدەیەك یا تەمەنی کەسێکدا).

**either** (ē'thēr, ī'thēr), *adj.* (١) هەرچی کامێکیان (لە دوو شت)؛ هەرکامیان: *( Use ~ hand.)*. (٢) هەریەکێکیان (لە دوو شت)؛ هەردووکیان:

*( He had a tool in ~ hand.)*

**pron.** یەکێکیان (لە دوو شت)؛ هەرکامیان.

**conj.** یان؛ یا *( E~ go or stay.)* .

**adv.** (١) هەر وەك ئەوی تر؛ – یش (ئەویش، منیش، تۆیش):

*( If she dosen't go, he won't go ~ .)*

(٢) [Colloq.] دووپاتکردنەوەی وەڵامێك بە " نەء " :

*( You took it. I didn't ~ .)*

**ejaculate** (i-jak′yoo-lāt′, ē-jak′yoo-lāt′), ***v.t.*** (١) ئاوهاتنەوە

(٢) هاوارکردن؛ بە دەنگی بەرز ووتن.

**ejaculation** (i-jak′yoo-lā′shən), ***n.*** (١) ئاوهاتنەوە.

(٢) هاوارکردن؛ بە دەنگی بەرز ووتن.

**ejaculatory** (i-jak′yoo-lə-tôr′i, ē-jak′yoo-lə-tō′ri), ***adj.***

***Also*** **ejaculative,** (١) هی ئاوهاتنەوە؛ تایبەتی بە ئاوهاتنەوە

(٢) هی هاوار یا هاوارکردن.

**eject** (i-jekt′, ē-jekt′), ***v.t.*** (١) دەرکردن؛ فڕێدانە دەرەوە؛ دەرپەڕاندن.

(٢) لێ هاتنەدەرەوە

***v.i.*** *( The pilot ~ed from the airplane safely.)* خۆ فڕێدانە دەرەوە.

**ejection** (i-jek′shən, ē-jek′shən), ***n.*** (١) دەرکردن؛ فڕێدان؛

لێ هاتنەدەرەوە. (٢) شتێکی لێ هاتووەدەرەوە یا فڕێدراو.

**ejectment** (i-jekt′mənt, ē-jekt′mənt), ***n.*** (١) دەرکردن؛

دەرپەڕاندن؛ فڕێدانە دەرەوە. (٢) سەندنەوەی زەوی‌وزاری داگیرکراو لە ڕێگای دادگاوە

**ejector** (i-jek′tēr, ē-jek′tēr), ***n.*** (١) دەرکەر (مرۆ، شت)؛ فڕێدەر.

(٢) ئامێری فڕێدانی قاوغی گوللەی دەمانچە یا تفەنگ پاش تەقاندنی.

**eke** (ēk), ***v.t.*** [Archaic or Dial.]. زیادکردن؛ درێژەپێدان؛ کشاندن.

**eke out,** (١) کشاندن؛ زیادکردن؛ خستنەکار:

*( He eked out his income by writing stories.)*

(٢) بە کولەمەرگی ژیان.

**eke** (ēk), ***adv. & conj.*** [Archaic], هەروەها

**elaborate** (i-lab′ēr-it), ***adj.*** وورد (کردار، کار)؛ ووردو ئاڵۆز:

*( an ~ piece of work)*

***v.t.*** (١) کارێکی قورس کردن بە هەوڵ و کۆششێکی زۆر.

(٢) بە وورد و پوختی و دوورودرێژی کردنی شتێك.

***v.i.*** **( ~ on; ~ upon),** لەسەر ڕۆیشتن و ڕوونکردنەوە (باس)؛

بە دوورودرێژی باسکردن.

**-elaboration** ***(n.)***; **elaborator** ***(n.)***.

**eland** (ē′lənd), ***n.*** بەرانە کێوییەکی ئەفەریقایی گەورەی شاخ درێژو

خوارو خێچە.

**elapse** (i-laps′), ***v.i.*** تێپەڕبوون (کات)؛ بەسەرچوون؛

بەسەردا ڕ بوردن

**elastic** (i-las′tik), ***adj.*** (١) دەکشێت؛ بۆی هەیە بکشێت یا بکشێنرێت

(٢) نەرم؛ بەئاسانی دەگۆڕێت یا دەتوانرێت بگۆڕدرێت: *( ~ regulations)* .

***n.*** (١) قوماشێکی لاستیکی. (٢) کاڵایەکی لاستیك.

(٣) لاستیك؛ پێبەستی لاستیك

**-elastically** ***(adv.)***.

**elasticity** (i-las′tis′ə-ti, ē′las-tis′ə-ti), ***n.*** (١) نەرمی؛

بەئاسانی ڕاهاتن. (٢) کشان.

**elasticize** (i-las′tə-sīz′), ***v.t.*** والێکردن کە بەئاسانی بکشێت بە

تێکەڵاوکردنی لاستیك لەگەڵیدا (قوماش)؛ وەك لاستیك لێکردن (لە نەرمیو

ئاسانی گۆڕین و ڕاهاتندا).

**elate** (i-lāt′, ē-lāt′), ***v.t.*** زۆر دڵخۆش کردن؛ زۆر شادو شاناز کردن.

**elated** (i-lāt′id, ē-lāt′id), ***adj.*** زۆر شاد؛ زۆر دڵخۆش؛ شادمان.

**elation** (i-lā′shən, ē-lā′shən), ***n.*** شادی؛ دڵخۆشییەکی ئێجگار

زۆر

**elbow** (el′bō), ***n.*** (١) ئانیشك.

(٢) ئانیشکە: پارچە بۆرییەکی وەك ئانیشك وایە دوو بۆری پێکەوە پێ

دەبەسترێت.

***v.t.*** ئانیشك تێوەژەندن.

***v.i.*** جێگەی خۆ کردنەوە بە ئانیشك ژەندن لە خەڵکەوە.

**at one's elbow,** زۆر نزیك.

**out at (the) elbows,** جلوبەرگ دڕاو؛ هەژار.

**rub elbows with,** خۆ لەگەڵدا تێکەڵاوکردن (لەگەڵ کەسانی ناودار)؛

لەگەڵدا هەڵسان و دانیشتن

**up to the elbows,** زۆر پێوە خەریك بوون.

**elbow-room** (el′bō-room′, el′bō-room′), ***n.*** جێ ئانیشك؛

ئەوەندە جێگە کە بەئاسانی تێیدا کاربکەیت یا بجوڵێیتەوە؛ جێگە؛ فراوانی.

**elder** (el′dēr), ***adj.*** (١) گەورە (برا، خوشك)؛ گەورەتر:

*( an ~ sister or brother)*

(٢) پلە بەرزتر؛ سەرگەورە.

***n.*** (١) کەسێکی بەتەمەنداچوو؛ کەسێکی تەمەن گەورە.

(٢) کەسێکی پیر. (٣) باووباپیر.

(٤) دەم ڕاست؛ پیاوماقووڵ؛ گەورەی خێڵ یا کۆمەڵ.

(٥) یەکێك لە سەرۆکەکانی ڕێکخراوی هەندێك کڵێسە

(٦) سەرەك قەشە لە کڵێسەی " مۆرمەن " دا.

**elder** (el′dēr), ***n.*** جۆرە ڕووەکێکە گوڵی سپی یا پەمەیی و بەری وەك

تووترك یا شیلان دەگرێت

**elderly** (el′dēr-li), ***adj.*** تەمەندار؛ بەتەمەنداچوو؛ نەختێك پیر؛ پیر.

**elder statesman,** کاربەدەستێکی گەورەی میری خانەنشینە کە هێشتا

هەر ڕاوێژی لەگەڵ دەکرێت و ڕای وەردەگیرێت لەلایەن کاربەدەستانی ئێستای

میرییەوە.

**eldest** (el′dist), ***adj.*** بەتەمەنترین؛ نۆبەرە (کوڕ، کچ، برا، خوشك):

*( the ~ brother / sister, child / ; my ~ son / daughter / )*

**elect** (i-lekt′, ə-lekt′), ***adj.*** (١) هەڵبژێراو.

(٢) هەڵبژێراوە بەڵام هێشتا نەچووەتە سەر کار (کاربەدەست):

*( mayor- ~ ; president- ~ )*

(٣) هەڵبژێراو لەلایەن خوداوە بۆ چوونە بەهەشت (ئاین).

***n.*** کەسێکی هەڵبژێراو.

***v.t.*** (١) هەڵبژاردنی کاربەدەستێك بە دەنگدان. (٢) هەڵبژاردن.

(٣) هەڵبژاردن بۆ چوونە بەهەشت (لەلایەن خوداوە).

***v.i.*** هەڵبژاردنی کاربەدەستێك بە دەنگدان.

**the elect,** (١) هەڵبژاردە: ئەو کەسانەی بەشێکن لە کۆمەڵێك کە مافی

تایبەتی هەبێت؛ هەڵبژێراوان

(٢) هەڵبژێراوان (ئاین): ئەوانەی خودا هەڵی بژاردوون بۆ چوونە بەهەشت

**election** (i-lek′shən, ə-lek′shən), ***n.*** (١) هەڵبژاردن

(٢) هەڵبژاردنی کاربەدەستان بە دەنگدان.

(٣) هەڵبژاردنی کەسانی تایبەتی لەلایەن خوداوە بۆ چوونە بەهەشت

**electioneer** (i-lek′shən-ēr′, ə-lek′shən-ēr′), ***n.*** دەنگ

وەرگرتن بۆ نوێنەرێك یا پاڵپشتی کردنی بۆ سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنێکدا

**elective** (i-lek′tiv, ə-lek′tiv), ***adj.*** (١) بە هەڵبژاردن (کاربەدەستی):

*( an ~ office)*

(٢) هەڵبژێر؛ خاوەن مافی هەڵبژاردن

(٣) هەوەسی: دەکەوێتە سەر هەوەس یا کەیفی ئەو کەسە خۆی ئایا

هەڵیدەبژێرێت یا نا .

***n.*** کۆرسێکی زانکۆ یا قوتابخانە کە دەکەوێتە سەر هەوەس یا کەیفی قوتابی

خۆی کە ئایا بیخوێنێت یا نا

**elector** (i-lek′tēr, ə-lek′tēr), ***n.*** (١) هەڵبژێر؛ دەنگدەر.

(٢) [-:i]، یەکێك لە شازادەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای کۆن کە بەشداری دەکرد

لە هەڵبژاردنی ئیمپراتۆردا.

**electoral** (i-lek′tēr-əl, ə-lek′tēr-əl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە

هەڵبژاردن یا هەڵبژێران. (٢) لە هەڵبژێران پێکهاتووە: *( an ~ college)* .

**electoral college,** ئەنجوومەنی هەڵبژێران: ئەنجوومەنێکە هەموو دەنگدەرانی ئەمەریکا هەڵی دەبژێرن وە ئەمیش سەرەك کۆمارو جێگرەکەی هەڵدەبژێرێت

**electorate** (i-lek′tēr-it, ə-lek′tēr-it), ***n.*** (١) دەنگدەران؛ هەڵبژێرەن؛ هەموو ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە لە هەڵبژاردنێکدا. (٢) ناوچەیەکی هەڵبژاردن؛ ناوچەیەکی هەڵبژێران. (٣) پلەی شازادەیەکی ئیمپراتۆرنشینی ڕۆمای کۆن (کە بەشدار دەبوو لە هەڵبژاردنی ئیمپراتۆردا). (٤) شازادەنشین؛ ناوچەیەك کەشازادەیەکی وەها بەڕێوەی دەبرد.

**electric** (i-lek′trik, ə-lek′trik), ***adj. Also*** **electrical.** (١) ئەلەکتریکی؛ ئەلەکتریك گەیەنەر؛ ئەلەکتریکدار: ***( an ~ wire)*** . (٢) ئەلەکتریك درووستکەر؛ بە ئەلەکتریك کراو: ***( an ~ generator)*** . (٣) ئەلەکتریکی؛ بە ئەلەکتریك کارکەر: ***( an ~ iron)*** . (٤) ووروووژێنەر؛ بەجۆش؛ هێنەرەجۆش.
***n.*** (١) ماددەیەك کە ئەلەکتریك ناگەیەنێت بەڵام تەووژمی ئەلەکتریکی تێدا کۆدەکرێتەوە یا پێ دەبزوێنرێت (٢) شەمەندەفەرێکی ئەلەکتریکی.
-electrically ***(adv.).***

**electrical engineering,** ئەندازیاری ئەلەکتریکی (زانیاری).

**electrical chair,** کورسی ئەلەکتریکی (بۆ کوشتنی تاوانباران).

**electrician** (i-lek′trish′ən, ē′lek-trish′ən), ***n.*** کارەباچی؛ ئەلەکتریکچی

**electricity** (i-lek′tris′ə-ti, ē′lek-tris′ə-ti), ***n.*** (١) ئەلەکتریك؛ کارەبا (٢) تەووژمی ئەلەکتریك (٣) زانستی ئەلەکتریك؛ ئەلەکتریکناسی. (٤) جۆش؛ جۆش‌وخرۆش؛ وورووژاندن
***( Her entrance created ~ in the room.)***

**electrification** (i-lek′trə-fi-kā′shən, ə-lek′trə-fi-kā′-shən), ***n.*** (١) ئەلەکتریك خستنەسەر یا لێدان؛ کردن بە ئەلەکتریك. (٢) هەموو ئەو کەرەسە یا تفاقەی پێویستە بۆ ئەلەکتریك.

**electrify** (i-lek′trə-fī′, ə-lek′trə-fī′), ***v.t.*** (١) ئەلەکتریك خستنە سەر یا لێدان (٢) ڕاچڵەکاندن یا دڵ داخورپاندن بە تەووژمی ئەلەکتریك (٣) کەرەسەی ئەلەکتریك تێدا دانان (٤) هێنانە جۆش‌وخرۆش؛ وورووژاندن:
***( He ~ied the crowd with his speech.)***
-electifier ***(n.).***

**electro-** (i-lek′trō, ə-lek′trə), پێشگرێکە بەمانای: (١) ئەلەکتریکی. (٢) بە ئەلەکتریك (٣) ئەلەکتریك؛ کارەبا.

**electrocardiogram** (i-lek′trō-kär′di-ə-gram′, ə-lek′-trō-kär′di-ə-gram′), ***n.*** وێنەی ئەلەکتریکی دڵ و نیشکردنی (پزیشکەوانی)

**electrocardiograph** (i-lek′trō-kär′di-ə-graf′, ə-lek′-trə-kär′di-ə-gräf′), ***n.*** ئامێری وێنەی ئەلەکتریکی گرتنی کارکردنی دڵ

**electrocute** (i-lek′trə-kūt′, ə-lek′trə-kūt′), ***v.t.*** (١) کوشتنی تاوانبارێك بە تەووژمی ئەلەکتریك. (٢) بە ئەلەکتریك کوشتن بە تەووژمی کارەبا بە ڕێکەوت.
-electrocution ***(n.).***

**electrode** (i-lek′trōd, ə-lek′trōd), ***n.*** جەمسەری ئەلەکتریکی (وەك هی پاتری)

**electrograph** (i-lek′trə-graf′, ə-lek′trə-gräf′), ***n.*** (١) وێنەی کرداری ئەلەکتریك. (٢) ئامێری ئەلەکتریکی نەقش هەڵکەندن. (٣) وێنەی تیشکی ئێکس (٤) بە تەلەگراف ناردنی وێنە. (٥) وێنەی بە تەلەگراف نێردراو.

**electrolysis** (i-lek′trol′ə-sis, ə-lek′trol′ə-sis), ***n.*** ئاوێتەی کیمیایی جیاکردنەوە بۆ بەشەکانی بە تەووژمی ئەلەکتریك.

**electrolyte** (i-lek′trə-līt′, ə-lek′trə-līt′), ***n.*** ماددەی ئەلەکتریك گەیەنەر.

**electromagnet** (i-lek′trō-mag′nit, ə-lek′trō-mag′nit), ***n.*** موگناتیسی ئەلەکتریکی؛ پارچە ئاسنێکی موگناتیس کراو بە تەووژمی ئەلەکتریك.
-electromagnetic ***(adj.).***

**electromagnetism** (i-lek′trō-mag′nə-tiz′m, ə-lek′trō-mag′nə-tiz′m), ***n.*** (١) موگناتیسی پەیدابوو بەهۆی تەووژمی ئەلەکتریك. (٢) زانیاری لێکۆڵینەوەی نێوان موگناتیس و ئەلەکتریك (فیزیا).

**electron** (i-lek′tron, ə-lek′tron), ***n.*** ئەلەکترۆن: گەردیلەی ساردی ئەتۆم.

**electronic** (i-lek′tron′ik, ə-lek′tron′ik), ***adj.*** ئەلەکترۆنی؛ ئەلەکترۆنیکی.

**electronics** (i-lek′tron′iks, ə-lek′tron′iks), ***n.pl.*** زانستی ئەلەکترۆنیك: زانستی لێکۆڵینەوەی کاری ئەلەکترۆنی لە بۆشایی و گازداو هەروەها بەکارهێنانی ئامێری ئەلەکترۆنی (فیزیا).

**elegance** (el′ə-gəns), ***n.*** (١) تەڕپۆشی؛ شۆخ‌وشەنگی؛ شۆخی؛ جوانی؛ قۆزی؛ لەنجەولار؛ ڕێك‌وپێکی (نەخشە، جل‌وبەرگ، شێواز، ڕەووشت... هتد). (٢) شتێکی ڕێك‌وپێك یا تەڕپۆش و جوان.

**elegancy** (el′ə-gən-si), ***n.*** = **elegance.**

**elegant** (el′ə-gənt), ***adj.*** (١) تەڕپۆش؛ شۆخ‌وشەنگ؛ شۆخ؛ قۆز؛ جوان؛ بەلەنجەولار؛ ڕێك‌وپێك و جوان (نەخشە، شوێن، جل‌وبەرگ، شێواز، هەڵسان و دانیشتن). (٢) [Colloq.]، نایاب.

**elegiac** (el′ə-jī′ək, i-lē′ji-ak′), ***adj.*** غەمگین؛ شیوەنی؛ لاوانەوە.
***n.*** (١) دوو خشتەکی‌یەکی شیوەنی یا لاوانەوە. (٢) (*pl.*) چەند دوو خشتەکی‌یەکی وەها؛ هەڵبەستێك کە هەمووی لە دوو خشتەکی شیوەنی پێکهاتبێ.

**elegist** (el′ə-jist), ***n.*** هۆنەری هۆنراوەی شیوەنی.

**elegy** (el′ə-ji), ***n.*** هەڵبەستی شیوەن؛ هۆنراوەی شیوەن و بۆ لاوانەوە؛ هەڵبەستێکە کە بەسەر کەسێکدا هەڵدەدرێت پاش مردنی.

**element** (el′ə-mənt), ***n.*** (١) یەکێك لەو چوار گەوهەر یا توخمەی کە وا بڕوا بوو سرووشتی لێ پێکدێت: خاك و هەواو ئاگرو ئاو. (٢) یەکێك لەم چوار گەوهەرە کە دەورووبەری بابەتە گیاندارێك بێت. (٣) دەورووبەر؛ دەوروپشت. (٤) گەوهەر؛ نەژاد؛ بەشی سەرەکی؛ توخم (٥) توخم یا ماددەیەکی کیمیایی کە بەش ناکرێت یا وورد ناکرێتەوە (٦) (*pl.*) نان و شەرابی شێوی خودایی (خاچ پەرستی). (٧) (ا) خاڵێك یا هێڵێك کە ڕوویەك یا وێنەیەکی ئەندازەیی لێ پێکدێت. (ب) دیفرێنشەڵ (بیرکاری). (٨) دانە بەشێکی ڕۆلە فڕۆکە (هێزی ئاسمانی).
**in one's elements,** لە شوێنێك یا کارێکدا بوون کە ئەو کەسە شارەزای بێت و بەدڵی بێت؛ لە دەورووبەری گونجاودا بوون.
**out of one's element,** لە شوێنێك یا بارێکی نابەدڵ و ناخۆشدا بوون؛ لە دەورووبەری نەگونجاو یا نەشیاودا بوون.
**the elements,** (١) سەرەتاکان؛ بنچینەکان. (٢) ئەو هێزانەی سرووشت کە ئاووهەوایان لێ پێکدێت وەك با، باران، سەرما، گەرما... هتد.

**elemental** (el′ə-men′t'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە یەکێك لەو چوار گەوهەرەی کە وا دەزانرا سرووشتیان لێ پێکدێت: خاك، هەوا، ئاگرو ئاو (٢) وەك هێزی سرووشتی (٣) بنچینەیی؛ سەرەکی؛ سرووشتی و بەهێز:
***( Hunger and sex are ~ drives.)***
(٤) سەرەتایی؛ سادە (٥) گرنگ. (٦) تاکە توخم نەك ئاوێتە (کیمیا).

**elementary** (el′ə-men′tēr-i), ***adj.*** (١) سەرەتایی. (٢) بنچینەیی؛ سەرەکی؛ گرنگ. (٣) تاکە توخم نەك ئاوێتە (کیمیا).
-elemetarily ***(adv.)***; **elementariness** ***(n.).***

**elementary school,** قوتابخانەی سەرەتایی.
(هەروەها پێی دەوترێ: **grade school, grammar school**).
**elephant** (el′ə-fənt), *n.* فیل.
**elephantiasis** (el′ə-fən-tī′ə-sis), *n.* نەخۆشییەکی درێژخایەنە بریتییە لە چرچ و ڕەقبوونی پێست (وەك هی فیل) وە هەوکردنی ئەندامی لەش (بەتایبەتی لاق و ئەندامی زاووزێ).
**elephantine** (el′ə-fan′tēn, el′ə-fan′tīn), *adj.* (١) فیلی؛ وەك فیل (٢) قەبەو ناقۆلا؛ فیلەتەنی؛ زل و ناکارامە.
**elevate** (el′ə-vāt′), *v.t.* (١) بەرزکردنەوە؛ بلندکردنەوە؛ هەلبڕین (٢) دەنگ بەرزکردنەوە. (٣) پایە بلندکردن؛ پلەوپایە بەرزکردنەوە؛ شکۆ پێدان (٤) وورە پێدان؛ وورە بەرزکردنەوە؛ شادکردن.
**elevated** (el′ə-vāt′id), *adj.* (١) بەرزکراوە؛ هەلبڕاو. (٢) بەرز؛ بەشکۆ؛ بلند. (٣) دلخۆش؛ بەکەیف؛ بەدەماخ.
*n.* [Colloq.], هێلی شەمەندەفەری بەرز.
**elevation** (el′ə-vā′shən), *n.* (١) بەرزکردنەوە؛ بەرزبوونەوە؛ بلندکردنەوە (٢) شوێنێکی بەرز.
(٣) بەرزی؛ بەرزایی (لە ڕووی زەوییەوە): *(the ~ of a mountain)*.
(٤) پایەبەرزی؛ بەرزی (پلەوپایە)؛ شکۆ؛ بەشکۆیی.
(٥) بەرزی ئەستێرەیەك لە ئاسۆوە. (٦) بەرزی یا بەرزایی لە ئاستی دەریاوە.
**elevator** (el′ə-vā′tēr), *n.* (١) بەرزکەرەوە؛ هەلبڕ (مرۆڤ، ئامێر). (٢) پەیژەی کارەبایی. (٣) عەماری لوولەکی دانەوێلە. (٤) پارچەیەکی جوولاوە بە کلکی فڕۆکەوە بۆ بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی فڕۆکە لەکاتی فڕیندا.
**eleven** (i-lev′′n, ə-lev′′n), *n.* یانزە
**elevenfold** (i-lev′′n-fōld′, ə-lev′′n-fōld′), *adj.* (١) یانزە-بەش؛ یانزە پارچەیی. (٢) یانزە ئەوەندە.
*adv.* یانزە ئەوەندە
**eleventh** (i-lev′′nth, ə-lev′′nth), *adj.* (١) یانزەهەم (٢) یانزە یەك.
*n.* (١) یانزەهەم (٢) یانزە یەك.
**at the eleventh hour,** لە دوا خولەکدا؛ لە دوا هەناسەدا؛ درەنگ؛ زۆر درەنگ
**elf** (elf), *n.* (١) جنۆکە (٢) منداڵێکی هاروهاج و چەتوون و کەتنباز و زیانبەخش (٣) کەسێکی کورتەبالا.
**elfin** (el′fin), *adj.* جنۆکەیی؛ هاروهاج و زیانبەخش.
*n.* = elf.
**elfish** (el′fish), *adj.* جنۆکەیی؛ تایبەتی بە جنۆکە؛ هاروهاج و چەتوون و زیانبەخش
**elicit** (i-lis′it), *v.t.* لێ دەرهێنان؛ هێنانەدەرەوە؛ بوون بە هۆ:
*(His hostile question ~ed an angry reply.; to ~ the truth from somebody)*
-elicitation *(n.)*.
**elide** (i-līd′), *v.t.* (١) پەڕاندنی تیپە بزوێن یا بڕگەی ووشەیەك لە بێژاندا. (٢) (ا) لابردن؛ نەهێشتن. (ب) کردن بە ژێرەوە؛ کردن بە ژێر لێوەوە؛ نەخستنەڕوو
**eligibility** (el′i-jə-bil′ə-ti), *n.* (١) شیان (بۆ فەرمانبەری، وەرگیران لە زانکۆ... هتد)؛ لێهاتوویی؛ لێهاتن. (٢) (*pl.*) تایبەخوێەك کە شتێك دەشێنێت.
**eligible** (el′i-jə-b′l), *adj.* شیاو (بۆ کار وەرگرتن، چوونە زانکۆ، ژنهێنان و شووکردن... هتد)؛ بۆ هەلبژاردن دەشێت.
**eliminate** (i-lim′ə-nāt′, ə-lim′ə-nāt′), *v.t.* (١) لابردن؛ نەهێشتن؛ لەناوبردن (٢) خستنەلاوە؛ پەسەند نەکردن؛ گوێ پێ نەدان. (٣) لە لەش کردنەدەرەوە (پیسایی)؛ گووکردن؛ پیسایی کردن.
-elimination *(n.)*; eliminative *(adj.)*; eliminator *(n.)*; eliminatory *(adj.)*.
**elision** (i-lizh′ən), *n.* پەڕاندنی تیپە بزوێن یا بڕگەی ووشەیەك لە بێژاندا
**elite** (i-lēt′, ā-lēt′), *n.* (١) پێشەنگ؛ پێشڕەوەکان؛ هەلبژاردەی کۆمەل: *(the ~ of society)*
(٢) جۆرە تیپێکی چاپەمەنی
**elixir** (i-lik′sēr), *n.* (١) ئەلیکسیر؛ ئەکسیری ژیان مادەیەکی خەیاڵییە کیمیاگەرانی کۆن دەیان ووت گوایە کانزای بێ نرخی پێ دەکرێتە زێڕ یا تەمەنی پێ درێژ دەکرێتەوە. (هەروەها پێشی دەووترێت: " بەردی فەیلەسوف "). (٢) [Rare]، گەوهەر؛ بنچینەی شت. (٣) دەرمانێك کە هەموو جۆرە نەخۆشییەك چاك دەکاتەوە.
**Elizabethan** (i-liz′ə-bē′thən), *adj.* تایبەت بە چەرخی فەرمانڕەوایی " ئەلیزابێس " شاژنی ئینگلتەرا لەسەدەی شانزەهەمدا: *(E~ poetry)*
*n.* کاربەدەست، نووسەر، یا هۆنەرێکی ئینگلیزی چەرخی " ئەلیزابێس ".
**elk** (elk), *n.* کەلەکێوی؛ بەرانە کێوی.
**ell** (el), *n.* گەز (پێوان).
**ellipse** (i-lips′, ə-lips′), *n.* شێوەیەکی هێلکەیی (ئەندازە).
**ellipsis** (i-lip′sis, ə-lip′sis), *n.* (١) پەڕاندنی ووشەیەك یا چەند ووشەیەك (لە ڕستەیەکدا کە کارناکەتە سەر مانای ڕستەکە (ووشەی ناو کەوانەکان لەم دوو ڕستەیەدا):
| If ( it is ) possible ( you ) come early.|;
| The man ( whom ) I saw |.
(٢) نیشانەی پەڕاندنی ووشە یا تیپ لە ڕستەدا (کە بریتییە لە چەند خاڵێك یا ئەستێرەیەك).
**ellipsoid** (i-lip′soid, ə-lip′soid), *n.* شێوەیەکی ڕوو هێلکەیی (ئەندازە).
-ellipsoidal *(adj.)*.
**elliptic** (i-lip′tik, ə-lip′tik), *adj.* *Also* elliptical, (١) هێلکەیی؛ شێوە هێلکەیی. (٢) تایبەتی بە پەڕاندنی ووشەیەك یا چەند ووشەیەك لە ڕستەیەکدا بەبێ کارکردنە سەر مانای ڕستەکە (ووشەی پێشوو ببینە).
**ellipticity** (i-lip′tis′ə-ti, el′ip′tis′ə-ti), *n.* هێلکەییتی (ئەندازە).
**elm** (elm), *n.* (١) ڕەشەدار. (٢) داری ئەم درەختە.
**elocution** (el′ə-kū′shən), *n.* (١) هونەری شت خوێندنەوە، ووتاردان، یا دووان لە کۆبوونەوەی گشتیدا. (٢) شێوەی ووتار خوێندنەوە یا دووان لە کۆبوونەوەی گشتیدا.
-elocutionary *(adj.)*.
**elocutionist** (el′ə-kū′shən-ist), *n.* مامۆستای هونەری ووتار خوێندنەوە؛ ووتار یا هۆنراوە خوێنەرەوە لە کۆبوونەوەی گشتیدا
**elongate** (i-lôŋ′gāt), *v.t. & v.i.* ڕاکێشان؛ کشاندن؛ درێژکردنەوە؛ کشان؛ درێژبوونەوە.
*adj.* (١) کشاو؛ ڕاکێشراو؛ درێژبووەوە. (٢) باریك و درێژ (گەلا).
-elongation *(n.)*.
**elope** (i-lōp′, ə-lōp′), *v.i.* ڕەدووکەوتن؛ ڕاکردنی کوڕ و کچێك بەدزییەوە بۆ یەکتر مارەکردن
-elopement *(n.)*; eloper *(n.)*.
**eloquence** (el′ə-kwəns), *n.* (١) ڕەوانبێژی؛ زمان پاراوی؛ زمان ڕەوانی. (٢) (ا) هونەری ڕەوانبێژی یا زمان ڕەوانی. (ب) توانا یا هێزی پێ سەلماندن لەڕێگەی ڕەوانبێژییەوە.
**eloquent** (el′ə-kwənt), *adj.* ڕەوانبێژ؛ زمان ڕەوان؛ زمان پاراو.
-eloquently *(adv.)*.
**else** (els), *adj.* تر؛ هی تر؛ جیا:
*( somebody ~ ; Is there anything ~ ?)*
*adv.* (١) تر؛ هی تر: *( Where ~ can I go ?)*.
(٢) ئەگینا: *( Study, (or) ~ you will fail.)*.
**elsewhere** (els′hwâr′), *adv.* لە شوێنێکی تر؛ شوێنێکی تر؛

***n.*** (١) پەتا؛ درم؛ نەخۆشییەك كە خەڵك لە یەكترییەوە دەیگرن.
(٢) بڵاوبوونەوەی درم. (٣) زوو بڵاوبوونەوەی باوێك یا مۆدەیەك.

**epidemiology** (ep´ə-dem´i-ol′ə-ji, ep´ə-dē´mi-ol′ə-ji), ***n.*** لێكۆڵینەوەو چارەسەركردنی درم (پزیشكەوانی).

**epidermis** (ep´ə-dûr′mis), ***n.*** (١) دیوی دەرەوەی پێست
(٢) دیوی دەرەوەی شانەی لەش.
(٣) دیوی دەرەوەی قاوغی گیانداری قاوغدار.

**-epidermal; epidermic; epidermoid** ***(adj.).***

**epigeal** (ep´ə-jē′əl), ***adj.*** (١) بۆ سەرەوە دەڕوێت (ڕووەك).
(٢) لەسەر زەوی یا نزیك لە ڕووی خاكەوە دەژی (جانەوەر).

**epigene** (ep′ə-jēn´), ***adj.*** لەسەر ڕووی زەوییە (وەك بەرد) (زەمیناسی).

**epigenesis** (ep´ə-jen′ə-sis), ***n.*** (١) تیۆرییەكە دەڵێت: كە ئاوڵەمە هەر لە یەكەم شانە پەیدا نابێت، بەڵكو لە كارتێكردنی دوولایی بەرە بەرەی دەوروبەرو پرۆتۆپلازم پێكدێت (زیندەوەرزانی).
(٢) گۆڕینی كانزا بۆ بەرد بەهۆی دەوروبەرەوە (زەمیناسی).

**-epigenetic** ***(adj.).***

**epiglottis** (ep´ə-glot′is), ***n.*** زمانە بچكۆلە

**epigram** (ep′ə-gram´), ***n.*** (١) هۆنراوەیەكی كورتو نەستەقانە یا لاقرتێیانە. (٢) پەند؛ ووتەیەكی نەستەقو كورتو سەیر.

**epigrammatic** (ep´i-grə-mat′ik), ***adj.*** (١) پڕ لە پەندی كورتو نەستەقو سەیر (٢) نەستەقو كورتو سەیرو لاقرتێیانە.

**-epigrammatically** ***(adv.).***

**epigramatism** (ep′ə-gram´ə-tiz'm), ***n.*** بەكارهێنانی ووتەی كورتو نەستەقو سەیرو هەندێك جار لاقرتێیانە لە وێژەدا.

**-epigramatist** ***(n.).***

**epigrammatize** (ep´ə-gram′ə-tīz′), ***v.t.*** دەربڕینی بیروڕا بە پەندی نەستەقو سەیر لە نووسینو دوواندا.

**epigraph** (ep′ə-graf´, ep′ə-gräf´), ***n.*** (١) پەندێكی هەڵكەنراو لەسەر خانوو، پەیكەر، یا كێلی گۆڕێك. (٢) ووتەیەكە كە لە سەرەتای پەڕتووكێك یا بەشێكیدا تۆمار دەكرێت (كە بریتییە لە پوختەی بیروڕای ئەو پەڕتووكە یا بەشە).

**-epigrapher** ***(n.)***; **epigraphic** ***(adj.)***; **epigraphist** ***(n.).***

**epigraphy** (e-pig′rə-fi), ***n.*** (١) نووسراوی هەڵكەنراو (لەسەر خانوو پەیكەر یا كێلی گۆڕێك). (٢) هەڵهێنانو لێكدانەوەو پۆل پۆل كردنی ئەم جۆرە نووسراوە هەڵكەنراوە (بەتایبەتی هی پێشینان).

**epilepsy** (ep′ə-lep´si), ***n.*** پەركەم؛ فێ؛ فێ لێهاتن.

**epileptic** (ep´ə-lep′tik), ***adj.*** فێی لەگەڵە؛ پەركەمی لەگەڵە.

**-epileptically** ***(adv.).***

**epileptoid** (ep´ə-lep′toid), ***adj.*** وەك پەركەم یا فێ.

**epilogue, epilog** (ep′ə-lôg´, ep′ə-log´), ***n.*** (١) بەشی كۆتایی چیرۆك یا هۆنراوەیەك (٢) هەڵبەستێك یا ووتارێكی كورت كە ئەكتەرێك یا زیاتر دەیخوێننێتەوە بۆ گوێگران لە كۆتایی شانۆنامەیەكدا
(٣) ئەو ئەكتەرە یا ئەكتەرانە كە ئەم هەڵبەستە دەخوێننێتەوە.

**Epiphany** (i-pif′ə-ni), ***n.*** (١) [e-] دەركەوتنی خودایەك یا شتێكی سەرناسا. (٢) [e-]، ڕوون بوونەوەی شتێكی لێڵ لە كۆتایی چیرۆك، فیلم، شانۆنامە. یا ڕوودانێكی سرووشتیدا. (٣) جەژنی دەركەوتنی عیسا (كە لە گەلێك كڵێسەدا یاد دەكرێتەوە دوانزە ڕۆژ دوای كریسمەس. (پێشی دەوترێت: Twelfth Night).

**episcopacy** (i-pis′kə-pə-si), ***n.*** (١) بەڕێوەبردنی كڵێسە لەلایەن سەرەك قەشەكانەوە. (٢) پلەو فەرمانو ماوەی مانەوەی سەرەك قەشە لە كاردا.
(٣) سەرەك قەشەكان.

**episcopal** (i-pis′kə-p'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە بەڕێوەبردنی كڵێسە لەلایەن سەرەك قەشەكانەوە. (٢) [E-]، تایبەتی بە یەكێك لە لقەكانی كڵێسەی پرۆتستانتی یا ئەنگلیكی (كە لەلایەن سەرەك قەشەكانەوە بەڕێوە دەبرێت).

**Episcopalian** (i-pis´kə-pā′li-ən, i-pis´kə-pāl′yən), ***adj.*** تایبەتی بە كڵێسەی " ئەپیسكۆپیلی " (دوو ووشەی پێشوو ببینە).
***n.*** ئەندامێكی ئەم جۆرە كڵێسەیە.

**-Episcopalianism** ***(n.).***

**episode** (ep′ə-sōd´), ***n.*** (١) بەشێكی شانۆنامەی یۆنانی كە لەنێوان دوو گۆرانی كۆرەسدا بوو؛ پەردە (شانۆنامە). (٢) ڕووداوێكی تەواوو نیمچە سەربەخۆ لە چیرۆك، هۆنراوە، یا شانۆنامەیەكدا؛ ئەڵقە (چیرۆك).
(٣) ڕووداوێك یا چەند ڕووداوێك كە هەر چەند بەشێكە لە شتێكی گەورەتر كە خۆی لە خۆی دا سەربەخۆو تەواوە؛ ئەڵقە (ڕوودان): *( an ~ in the war)*
(٤) بەشێك لە بەشەكانی چیرۆكێك كە هەر ماوەی بەشێكی بڵاودەكرێتەوە؛ ئەڵقە (چیرۆكێك كە بە بەش بەش بڵاودەكرێتەوە نەك هەمووی پێكەوە)

**episodic** (ep´ə-sod′ik), ***adj.*** (١) بەش بەش؛ پارچە پارچە (چیرۆك، هۆنراوە). (٢) لەلاوەیە؛ پەیوەندی كەمە بە باسە سەرەكییەكەوە؛ ڕووداوێكی نیمچە سەربەخۆیە.

**-episodical** ***(adj.)***; **episodically** ***(adv.).***

**epistemology** (i-pis´tə-mol′ə-ji), ***n.*** تیۆریو لێكۆڵینەوەی سەرچاوەو سرووشتو شێوازو سنووری زانست یا زانین؛ سەرچاوەی زانست

**-epistemological** ***(adj.).***

**epistle** (i-pis′'l), ***n.*** (١) نامە (بەتایبەتی هی درێژو ئامۆژگاری)؛ پەیام.
(٢) [E-]، (ا) یەكێك لەو نامانەی قوتابییەكانی عیسا نووسیویانە.
(ب) چەند نامەیەك لەمانە كە لەكاتی نوێژكردن لە كڵێسەدا دەخوێنرێتەوە.

**epistolary** (i-pis′tə-ler´i), ***adj.*** (١) نامەیی؛ لە شێوەی نامەدا؛ تایبەتی بە نامەو نامە نووسین. (٢) لە نامەدایە؛ بە نامە جێبەجێ دەكرێت (كاروبار)؛ لە نامە پێكهاتووە.

**epitaph** (ep′ə-taf´, ep′ə-täf´), ***n.*** (١) گۆڕنامە؛ نامەی لەسەر كێلە بەرد هەڵكەنراو (دەربارەی مردووەكە). (٢) هۆنراوەیەكی كورت بەبۆنەی كۆچی دوایی كەسێكەوە یا نەمانی شتێكەوە.

**epithalamion** (ep´i-thə-lā′mi-ən), ***n.*** = **epithalamium.**

**epithalamium** (ep´i-thə-lā′mi-əm), ***n.*** گۆرانی یا هەڵبەستی شایی (كە بەسەر بووك یا زاوا یا هەردووكیاندا هەڵدەدرێت).

**epithelioma** (ep´ə-thē´li-ō′mə), ***n.*** شێرپەنجەی ڕووی دەرەوە یا ناوەوەی لەش وەك هی پێست، دەم، قوڕگ، میزەڵدان

**epithet** (ep′ə-thet´), ***n.*** ناتۆرە؛ ناووناتۆرە:
**( a black-hearted villain; Alexander the Great)**

**-epithetic; epithetical** ***(adj.).***

**epitome** (i-pit′ə-mi), ***n.*** (١) پوختە؛ كورتە (باس، پەڕتووك، ڕاپۆرت).
(٢) نموونە؛ نوێنەر.

**epitomize** (i-pit′ə-mīz´), ***v.t.*** (١) پوختەكردن؛ بە كورتی باسكردن.
(٢) نموونە بوون؛ نواندن یا دەرخستنی هەموو لەلایەن نموونەیەكەوە

**epoch** (ep′ək), ***n.*** (١) چەرخ؛ سەرەتای چەرخێكی تازەو گرنگ لە مێژوودا؛ چەرخێكی گرنگ (٢) چەرخێكی جیۆلۆجی؛ چەرخی زەمینی

**equal** (ē′kwəl), ***adj.*** (١) هاوتا؛ هاوسەنگ؛ هاوتەرازوو؛ هاوكێش؛ وەك یەك؛ یەكسان. (٢) [Archaic]، هەق پەرست؛ بەویژدان؛ بێ لایەن
(٣) [Archaic]، تەخت؛ تەختو سافو لووس.
***n.*** شتێكی هاوتا، هاوسەنگ، یا هاوتەرازوو.
***v.t.*** (١) [Archaic]، هاوتاكردن؛ وەك یەك لێكردن؛ هاوتەرازوو كردن
(٢) ئەوەندەبوون؛ هاوتابوون؛ شان لە شان دان.
(٣) بۆ بژاردن؛ هەق بۆ كردنەوە.
equal to, لە ووزە هاتن؛ دەرەقەت هاتن

**equalitarian** (i-kwäl´ə-târ′i-ən, i-kwôl´ə-târ′i-ən), ***adj.*** یەكسانیخواز؛ یەكسانی پەرست.
***n.*** یەكسانی پەرستێك؛ كەسێك كە بڕوای بە یەكسانی مرۆڤ هەبێت لە هەموو مافێكدا.

**equality** (i-kwäl′ə-ti, i-kwôl′ə-ti), ***n.*** یەكسانی؛ یەكسانی مرۆڤ لە مافی كۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕامیاریدا.

**equalization** (ē´kwə-lə-zā′shən), *n.* (١) یەکسان کردن؛ هاوتاکردن؛ وەك یەك لێکردن. (٢) هاوسەنگی؛ هاوتایی؛ وەك یەکی.
**equalize** (ē′kwəl-īz´), *v.t.* هاوتاکردن؛ یەکسان کردن؛ هاوسەنگ کردن؛ وەك یەك لێکردن
**equalizer** (ē′kwəl-iz´ēr), *n.* هاوتاکەر (ئامێر، هێز)؛ یەکسانکەر؛ هاوسەنگکەر
**equally** (ē′kwəl-i), *adj.* (١) بەیەکسانی؛ وەکو یەك:
*( We divided the property ~ .)*
(٢) وەکو یەك؛ جوونیەك
*( He speaks English and French ~ well.)*
**equal mark ( or sign ),** نیشانەی یەکسانی = (بیرکاری)
**equanimity** (ē´kwə-nim′ə-ti, ek´wə-nim′ə-ti), *n.* هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ ژیری
**equate** (i-kwāt′), *v.t.* (١) هاوکێش کردن (بیرکاری). (٢) وەك یەك لێکردن؛ وەك یەك تەماشاکردن؛ بە هاوتا دانان.
**equation** (i-kwā′zhən, i-kwā′shən), *n.* (١) بە هاوتا دانان؛ وەك یەك سەیرکردن. (٢) هاوکێشە (بیرکاری).
**equator** (i-kwā′tēr), *n.* کەمەرەی زەوی؛ پشتێنەی زەوی؛ هێڵی یەکسانی یا ناوەراست
-equatorial *(adj.).*
**equestrian** (i-kwes′tri-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە ئەسپ و ئەسپ سواری. (٢) بە سواری ئەسپەوە *( an ~ statue)* .
*n.* ئەسپ سوار (لە خۆنوواندن یا لە " سیرك " دا).
**equestrienne** (i-kwes´tri-en′), *n.* ئەسپ سواری ژن (لە خۆنوواندن یا لە " سیرك " دا)
**equi-** (ē′kwə-, ē′kwi), پێشگرێکە بەمانای هاوتا؛ هاوسەنگ؛ وەك یەك
**equilateral** (ē´kwə-lat′ēr-əl), *adj.* لا یەکسان؛ هەموو لاکانی ئەوەندەی یەکن: *( an ~ triangle)*
*n.* شێوەی لا یەکسان (ئەندازە).
**equilibrate** (ē´kwə-lī′brāt, i-kwil′ə-brāt´), *v.t.* هاوتاکردن؛ هاوسەنگ کردن
-equilibration *(n.)*; equilibrator *(n.).*
**eqilibrium** (ē´kwə-lib′ri-əm), *n.* هاوسەنگی؛ هاوتایی؛ هاوکێشی؛ بەرامبەری.
**equinoctial** (ē´kwə-nok′shəl), *adj.* (١) تایبەتی بە یەکسان بوونی شەو و رۆژ لە بەهار و پایزدا. (٢) لەکاتی یەکسان بوونی شەو و رۆژدا رووبدات. (٣) هی هێڵی یەکسانی.
*n.* (١) هێڵی یەکسانی ئاسمانی (ئەستێرەناسی). (٢) باو بۆرانی کاتی یەکسانی شەو و رۆژ.
**equinox** (ē′kwə-noks´), *n.* یەکسانبوونی شەو و رۆژ (لە بەهار و پایزدا لە رۆژی ٢١ی ئەوروزو ٢١-٢٢ی گەلاوێژدا)
**equip** (i-kwip′), *v.t.* (١) کەرەستە پێدان؛ تفاق یا پێویستی پێدان
*( The soldiers were ~ped for battle.)*
(٢) ئامادەکردن (هۆش و مێشك و تێگەیشتن)؛ فێرکردن
(٣) خۆگۆڕین یا جلی تایبەتی لەبەرکردن (بۆ مەبەستێکی تایبەتی).
**eqipage** (ek′wə-pij), *n.* (١) کەرەستە؛ تفاق؛ پێداویستی. (٢) عەرەبانە (بەتایبەتی بە عەرەبانچی و مەیتەرەوە). (٣) دەست و پێوەند.
**equipment** (i-kwip′mənt), *n.* (١) کەرەستە؛ تفاق؛ پێداویستی. (٢) کەرەستە پێدان؛ تفاق پێدان و ئامادەکردن؛ ئامادەبوون.
**equitable** (ek′wi-tə-b'l), *adj.* رەوا؛ یەکسان؛ هەق؛ بەپێی ویژدان
-equitably *(adv.).*
**equity** (ek′wə-ti), *n.* (١) رەوابینی؛ هەقبینەت؛ بێ لایەنی. (٢) شتێکی رەوا. (٣) نرخی خانوو یا زەوی و زار پاش لێ دەرکردنی قەرزەکەی کە لەسەریەتی؛ بەشی خاوەن خانوو یا زەوی و زار پاش لێ دەرکردنی قەرز.

(٤) (ا) دادڵە بردن بۆ ویژدان لەکاتێکدا ئەگەر یاسا کەم و کووڕی تێدابێت. (ب) سەرجەمی بیروڕای رەوا کە پاشکۆی یاسایە. (ج) داوایەکی رەوا.
**equivalence** (i-kwiv′ə-ləns), *n.* هاوتایی؛ هاوسەنگی؛ بەرامبەری؛ یەکسانی.
**equivalency** (i-kwiv′ə-lən-si), *n.* = equivalence.
**equivalent** (i-kwiv′ə-lənt), *adj.* هاوتا؛ هاوسەنگ؛ یەکسان؛ بەرامبەر: *( What is five dollars ~ to in French money?)*
*n.* شتێکی هاوتا، هاوسەنگ، یا بەرامبەر.
**equivocal** (i-kwiv′ə-k'l), *adj.* (١) دوو مانابەخش؛ پێچ و پەنادار؛ لێڵ؛ دوودڵ؛ بە تاین و تۆین: *( an ~ reply)* .
(٢) نامسۆگەر؛ دووبەختی: *( an ~ outcome)* .
(٣) جێگەی گومانە؛ گومانبەخش؛ گومانی چەوتی لێ دەکرێت؛ پێچ و پەنادار:
*( ~ behavior)*
**equivocate** (i-kwiv′ə-kāt´), *v.i.* خۆنەدان بەدەستەوە (وەڵام، ووتە، هەڵوێست)؛ چەندوچۆنی کردن؛ ووتەی دوو مانایی بەکارهێنان بۆ خەڵەتاندن یا بەهەڵەدابردن؛ تاین و تۆین کردن؛ دووزمانی کردن.
**equivocation** (i-kwiv´ə-kā′shən), *n.* (١) تاین و تۆینکاری؛ تاین و تۆینبازی؛ پێچ و پەنا (ووتە)؛ درۆکاری؛ دووزمانی (٢) ووتەیەکی دوو مانایی و بە پێچ و پەنا بۆ خەڵەتاندن یا بەهەڵەدابردن.
**-er** (ēr), پاشگرێکە بەمانای: (١) (ا) بکەر: *(teacher, farmer)* .
(ب) ژیاو یا دانیشتوو: *( New Yorker)* .
(٢) – تر؛ گەورەتر؛ بچووکتر: *( bigger, smaller, later)* .
**era** (ēr′ə), *n.* (١) ساڵنامە؛ مێژوویەکی تایبەتی کە بە رووداێکی گرنگ دەست پێ دەکات: *( The Christian ~ )* .
(٢) رووداێکی گرنگ کە سەرەتای چەرخێکی پێوە دەناسرێت.
(٣) چەرخ؛ سەردەم. (٤) چەرخی جیۆلۆجی.
**eradiate** (ē-rā′di-āt´), *v.i.* تیشکدانەوە؛ شەوقدانەوە.
**eradicate** (i-rad′i-kāt´), *v.t.* (١) لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان؛ بنەبڕکردن؛ بنجبڕکردن. (٢) لەناوبردن؛ هیچ نەهێشتن؛ فەوتاندن؛ تێك و پێکدان
-eradicable *(adj.)*; eradicator *(n.).*
**eradication** (i-rad´i-kā′shən), *n.* لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان؛ بنەبڕکردن؛ لەناوبردن؛ هیچ نەهێشتن.
**erasable** (i-rās′ə-b'l), *adj.* دەتوانرێت بکوژێنرێتەوە یا بسڕێتەوە.
**erase** (i-rās′), *v.t.* (١) کووژاندنەوە (نووسینی سەر کاغەز یا تەختە)؛ سڕینەوە. (٢) سڕینەوە لە مێشك (لکە، یاد). (٣) [Slang]، کوشتن.
**eraser** (i-rās′ēr), *n.* (١) تەختەسڕ. (٢) لاستیکی کوژانەوە.
**erasure** (i-rā′shēr, i-rā′zhēr), *n.* (١) کوژاندنەوە؛ سڕینەوە. (٢) ووشەیەکی کوژاوە یا سڕاوە؛ شتێکی سڕاوە. (٣) شوێنی ووشەیەکی کوژێنراوە یا سڕێنراوە.
**ere** (âr), *prep. & conj.* [Poetic or Archaic], لەپێش (کات)؛ لەپێشدا؛ لەوەوپێش.
**erect** (i-rekt′), *adj.* (١) ڕەپ؛ بەل؛ قنج؛ وەستاو؛ بەپێوە وەستاو؛ قیت. (٢) ڕەق یا ڕاوەستاو (قژ). (٣) [Archaic]، (ا) بەکەیف؛ کەیف قنج. (ب) ووریا؛ هۆشیار.
*v.t.* (١) درووستکردن (خانوو، پەیکەر... هتد).
(٢) دانان (کۆسپ)؛ قوتکردنەوە: *( They ~ed social barriers.)* .
(٣) بەرزکردنەوە؛ بەقنجی دانان؛ بەپێوە دانان.
(٤) کۆکردنەوە؛ یەکخستن. (٥) [Archaic]، دامەزراندن؛ دانان.
(٦) وێنە درووستکردن (ئەندازە). (٧) ڕەپکردن (کێر)؛ ڕەق کردن
*v.i.* ڕەپ بوون؛ ڕەق بوون.
**erectile** (i-rek′t'l, i-rek′til), *adj.* ڕەپ یا ڕەق دەبێت؛ هەڵدەستێت (کێر).
**erection** (i-rek′shən), *n.* (١) درووستکردن؛ درووستبوون؛ دانان؛ دامەزراندن. (٢) شتێکی درووستکراو (خانوو). (٣) کێرهەڵسان یا ڕەپ بوون.

**erelong** (âr′lôŋ′), *adv.* [Archaic or Poetic], زوو؛ بەم زووانە؛ پاش ماوەیەکی کەم؛ زۆری پێ ناچێت.
**erewhile** (âr′hwīl′), *adv.* [Archaic], نەختێك لەمەوپێش؛ ماوەیەکی کەم لەمەوبەر.
**ergo** (ũr′gō), *conj. & adv.* کەوابوو
**ermine** (ũr′min), *n.* (١) دەڵەك (٢) فەروە یا پێستی دەڵەك
(٣) دادپرس كە ڕۆبەكەی فەروەی دەڵەكی لێ دەدرێت لە وڵاتەكانی ئەوروپادا؛ پلەی دادپرسی یا دادگەری.
**ermined** (ũr′mind), *adj.* (١) بە فەروەی دەڵەك ڕازێنراوەتەوە
(٢) فەروەی دەڵەكی لەبەردایە
**erode** (i-rōd′), *v.t.* (١) داڕزاندن؛ داخوران؛ خواردنەوە؛ بنكەن كردن: *( Acid ~s metal.)*
(٢) پێكهێنان لە بنكەن كردن یا داخوران (خەندەق، چەم). *( The running water ~ed a gully.)*
*v.i.* داخوران؛ داڕزین؛ بنكەن بوون؛ ڕاماڵین؛ خورانەوە؛ هەرەس بردن.
**erogenous** (i-roj′ə-nəs), *adj.* تایبەتی بەو ئەندام یا شوێنانەی لەش كە دەست تێوەدانیان مرۆڤ دەهێنێتە ئالۆش و خرۆش و هەوەس هەڵدەسێنێت: *( The ~ zones of the body)*
**Eros** (êr′os, er′os), *n.* خودای خۆشەویستی (ئەفسانەی یۆنان)
**erosion** (i-rō′zhən), *n.* ڕاماڵین؛ ڕاماڵینی خۆڵ و بەرد لەسەر ڕووی زەوی بەهۆی باو و بۆرانەوە؛ داماڵین؛ داخوران؛ بنكەن بوون؛ بنكەن كردن: *( Soil ~ can be prevented by planting trees.)*
**erosive** (i-rō′siv), *adj.* داڕزێنەر؛ دەیخواتەوە: *( an ~ acid)* .
**erotic** (i-rot′ik), *adj.* (١) هەوەس هەڵسێن؛ هەوەس بزوێن؛ هێنەرە جۆش و خرۆش؛ تایبەتی بە هەوەس هەڵسان یا هاتنەجۆش.
(٢) شەهوانی
*n.* (١) كەسێك كە زوو هەوەسی هەڵدەستێت یا دێتە ئالۆش و خرۆش؛ كەسێكی شەهوانی (٢) هەڵبەستێكی هەوەس هەڵسێن یا هێنەرە خرۆش.
**-erotically** *(adv.).*
**erotica** (i-rot′i-kə), *n.pl.* وێنەو پەڕتووك و گۆڤارو شتی تری هەوەس هەڵسێن یا هێنەرە خرۆش
**eroticism** (i-rot′ə-siz′m), *n.* (١) هەوەس هەڵسان؛ هاتنەخرۆش
(٢) هەستی زگماكی جووت بوون؛ ڕەوشتی جووت بوون؛ شەهوانێتی.
(٣) زۆر حەز لە جووت بوون كردن؛ هەمیشە لە خولیای جووت بووندا بوون.
**err** (ũr), *v.i.* (١) هەڵەكردن؛ بەهەڵەداچوون
(٢) لە ڕێگەی ڕاست لادان؛ بەدڕەفتاری كردن
(٣) [Obs.] ڕێگە لێ ون بوون؛ گومڕا بوون
**errand** (er′ənd), *n.* (١) چوون بۆ شوێنێكی نزیك بۆ پەیام بردن یا ئەرك بەجێهێنان بۆ كەسێكی تر (بەتایبەتی لەلایەن بەردەستێكەوە): *( to go on ~s for someone; to send someone on an ~ ; to run ~s)*
(٢) مەبەستی چوونێكی وەها؛ ئەو پەیام یا ڕاسپاردەیەی لە چوونێكی وەهادا دەگەیەنرێت؛ ئەو ئەرك یا فرمانەی لە چوونێكی وەهادا جێبەجێ دەكرێت.
(٣) ئەركێكی بچووك كە بەجێ بهێنرێ: *( I have some ~s to run.)* .
**errand-boy** (er′ənd-boi′), *n.* پەیامبەر؛ منداڵێك یا بەردەستێك كە دەنێررێت بە ڕاسپێرییەك بۆ شوێنێك یا ئەركی بچووكی دەدرێت بەسەر شاندا؛ فەڕاش
**errant** (er′ənt), *adj.* (١) گەڕیدە؛ گەڕۆك؛ بە دوای سەرەڕۆیی و سوارچاكیدا گەڕاو: *( a knight- ~ )*
(٢) نادرووست؛ بەد؛ لە ڕێگەی ڕاست لادەر؛ گومڕا.
**errantry** (er′ənt-ri), *n.* بە دوای سەرەڕۆیی و سوارچاكیدا گەڕان؛ سوارچاكی؛ ڕەوشت و هەست و كردەوەی سوارچاكی.
**errata** (i-rā′tə, e-rä′tə), *n. plural of* **erratum**, هەڵەی چاپەمەنی
**erratic** (ə-rat′ik), *adj.* (١) ناڕێك و پێك؛ لامسەرلا
(٢) گومڕا؛ سەیر؛ لە ڕێگەی ڕاست لادەر.
(٣) بەردی ڕاماڵراو بە ڕووباری سەهۆڵین.
*n.* كەسێكی سەیر، حولحولی، لامسەرلا، یا ڕێگە لێ تێكچوو.
**-erratically** *(adv.).*
**erratum** (i-rā′təm, e-rä′təm), *n. singular of* **errata**, هەڵەی چاپەمەنی.
**erring** (ũr′iŋ), *adj.* هەڵەكەر؛ هەڵەكار.
**erroneous** (ə-rō′ni-əs, e-rō′ni-əs), *adj.* هەڵە؛ بەهەڵەداچوو؛ چەوت: *( an ~ statement)* .
**error** (er′ẽr), *n.* (١) هەڵە؛ چەوتی.
(٢) بەدكاری؛ بەدڕەفتاری؛ ڕەووشت چەوتی.
**erst** (ũrst), *adv. & adj.* هی كۆن؛ هی زوو یا پێشوو؛ لە سەرەتادا؛ ڕابوردوو.
**erstwhile** (ũrst′hwīl′), *adj.* پێشوو؛ جاران؛ ڕابوردوو؛ لەوەوپێش: *( my ~ friend)*
**erudite** (er′yoo-dīt′, er′oo-dīt′), *adj.* زانا؛ زانیار؛ تێگەیشتوو؛ زۆرزان.
**erudition** (er′yoo-dish′ən, er′oo-dish′ən), *n.* زانایی؛ زانین؛ زانستی؛ زانیاری.
**erupt** (i-rupt′), *v.i.* (١) هەڵچوون (تواوەی ئاگرین)؛ تەقینەوە (ئاگرپژێن، قەڵبەزاوی گەرم)؛ فڕێدان (ئاو، هەڵم).
(٢) تەقینەوە (شەڕ)؛ لەپڕ دەستپێكردن: *( Fighting ( or war ) ~ed.)* .
(٣) دەردان (ئاوڵە، گەرمەژنە، زیپكە). (٤) دەرهاتن (ددان).
*v.t.* فڕێدان؛ تەقاندنەوە؛ هەڵچوواندن.
**eruption** (i-rup′shən), *n.* (١) تەقینەوە (ئاگرپژێن، قەڵبەزاوی گەرم، شەڕ). (٢) هەڵچوون (هەست، تووڕەیی، ناڕەزایی).
(٣) (ا) گەرمەژنە دەردان؛ زیپكە دەردان. (ب) گەرمەژنە؛ زیپكە
**-eruptive** *(adj.).*
**escalate** (es′kə-lāt′), *v.i.* (١) بەرزبوونەوە.
(٢) پەرەسەندن (جەنگ، ناكۆكی)؛ توندوتیژبوون؛ زیادكردن: *( The fighting ( or the war ) ~d.)*
*v.t.* (١) بەرزكردنەوە. (٢) پەرە پێ سەندن (شەڕ)؛ توندوتیژكردن؛ زیادكردن.
**escalation** (es′kə-lā′shən), *n.* (١) پەرەسەندن (جەنگ، ناكۆكی)؛ پەرە پێ سەندن؛ زیادبوون؛ توندوتیژكردن: *( Who is responsible for the ~ of the fighting ( or the war ) ?)*
(٢) بەرزكردنەوە؛ هەڵبڕین.
**escalator** (es′kə-lā′tẽr), *n.* پێ پلیكانەی ئەلەكتریكی؛ پەیژەی كارەبایی.
**escalator clause,** مەرجی پەیمانی كار لەنێوان خاوەن كارو كرێكاردا كە بەگوێرەی مووچەی كرێكار كەم و زۆر دەكرێت بەپێی هەرزانی و گرانی نرخی پێویستییەكانی ژیان.
**escapade** (es′kə-pād′, es′kə-pād′), *n.* (١) دەربازبوون؛ ڕاكردن؛ بەرەڵابوون. (٢) بەلەسەبوون؛ بەلەسەیی؛ كردەوەیەكی سەرەڕۆیی
**escape** (ə-skāp′, e-skāp′), *v.i.* (١) دەربازبوون (بەندیخانە)؛ ڕاكردن؛ هەڵهاتن؛ تێ تەقاندن.
(٢) دەربازبوون (كارەسات، ناخۆشی)؛ ڕزگاربوون: *( Two were killed in the accident but he ~d.)*
(٣) لێ چوون (ئاو، هەوا)؛ تكەكردن: *( some air ~d.)* .
(٤) لەبیرچوونەوە؛ دەرچوون؛ نەمان (لە یاددا): *( It ~ d from her memory.)*
*v.t.* (١) ڕاكردن؛ دەربازبوون؛ هەڵهاتن.
(٢) خۆدزینەوە لە؛ ڕزگاربوون: *( He ~d punishment.)* .
(٣) لێوە دەرهاتن؛ لێ دەرچوون؛ لە دەم دەرچوون: *( A scream ~d his lips.)*
(٤) لەبیرنەبوون؛ لەیادچوون: *( The exact date ~s me.)*

*n.* (١) ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ ڕزگاربوون. (٢) ڕێگە یا هۆی دەربازبوون.
(٣) تکە؛ لێ چوون؛ دادان
(٤) شتی خەم‌وخەفەت لەبیربەرەوە؛ شتی خەم ڕەوێن:
*( Movies are an ~ .)*
*adj.* (١) خەم ڕەوێن؛ خەم‌وخەفەت لابەر.
(٢) هۆی خۆدزینەوە لە ئەرك یا بەرپرسیاری‌یەك.

**escapement** (ə-skāp′mənt, e-skāp′mənt), *n.* (١) ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ ڕێگەی ڕزگاری (٢) ئەو بەشەی کاتژمێرە کە بزوانی چەرخی کاتژمێرەکە ڕێك دەخات (٣) ئەو بەشەی مەکینەیەك کە بزوانی مەکینەکە ڕێك دەخات. (وەك مەکینەی چاپەمەنی).

**escapism** (ə-skāp′iz'm, e-skāp′iz'm), *n.* (١) ڕاکردن لە ڕاستی و ناخۆشی ژیان (بەهۆی فیلم و ویژەو هونەری ترەوە).
(٢) ویژەو هونەری تر کە مرۆڤ بەهۆیانەوە خۆی ڕزگار دەکات بۆ ساتێك لە ناخۆشی ژیان و پەنا دەباتە بەر ژیانی خەیاڵ.

**escapist** (ə-skāp′ist, e-skāp′ist), *adj.* تایبەتی بە ویژەو هونەرێك کە مرۆڤ بەهۆیەوە لە ناخۆشی ژیان ڕادەکات بۆ سەردەمێك:
*( ~ literature)*
*n.* کەسێك کە خۆی دەدزێتەوە لە ناخۆشی و تەنگوچەڵەمەی ژیان.

**escarpment** (e-skärp′mənt), *n.* (١) کەندەڵان؛ لێژایی.
(٢) کەندەڵان یا لێژایی دەوری سەنگەرێك کە دەیپارێزێت.

**-escent** (es′'nt), پاشگرێکە بەمانای خەریکە؛ خەریکە دەبێت بە؛ لەو کاتەدایە *( convalescent, adolescent)* .

**eschew** (es-chōō′, es-chū′), *v.t.* خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ دزینەوە؛ نەکردن.

**escort** (es′kôrt), *n.* (١) ڕاییکەر بۆ پاراستن یا ڕێزلێگرتن (مرۆڤ، کەشتی، فڕۆکە ... هتد)؛ پارێزەر؛ پاسەوان. (٢) ئاوەڵ؛ پیاوێك یا منداڵێك کە لەگەڵ ئافرەتێکدا دەچێتە دەرەوە بۆ ئاگا لێ بوون؛ ژنێك کە لەگەڵ پیاوێکدا دەچێتە دەرەوە بۆ دەمەتەقێ؛ چاوساغ: کەسێك کە لەگەڵ کەسێکی تردا دەبێت بۆ سەرپەرشتی و ڕێگە پیشاندان.
(٣) لەگەڵ بوون؛ لەگەڵ چوون؛ ڕایی کردن.
*v.t.* ڕایی کردن: لەگەڵ بوون یا چوون بۆ پاراستن یا ڕێزگرتن؛ ئاوەڵی کردن؛ لەگەڵدا بوون بۆ بێ تاقەتی، دەمەتەقێ، یا سەرپەرشتی کردن.

**escritoire** (es′kri-twär′, es′kri-twôr′), *n.* مێزی نووسین (بە چەکمەجە و ڕەفەی پەرتووکەوە).

**escrow** (es′krō, e-skrō′), *n.* پەیمانێك یا سەنەدێکی بەینی دوو کەس (کڕیارو فرۆشیار) کە دەدرێت بە لایەکی سێیەم هەتا چەند مەرجێك جێبەجێ دەکرێت ئەوسا دەخرێتە کارەوە.
**in escrow,** لە لای لایەکی سێیەمە هەتا چەند مەرجێك جێبەجێ دەکرێت ئەوسا دەخرێتە کار (پەیمانی بەینی کڕیارو فرۆشیار وەك هی خانوویەك).

**esculent** (es′kyoo-lənt), *adj.* بۆ خواردن دەشێت؛ دەخورێت.
*n.* شتێك کە بۆ خواردن بشێت

**escutcheon** (i-skuch′ən), *n.* قەڵغانێك کە درووشم یا نیشانەی هۆزەکەی پێوەبێت
**a blot on one's escutcheon,** لەکەیەك بە دوای کەسێکەوە یا بە ناوبانگی‌یەوە؛ لەکە.

**-ese** (ēz), پاشگرێکە بەمانای (١) تایبەتی بە وڵاتێك یا خەڵکی وڵاتێك یا شێوازێکی تایبەتی؛ وەك (وڵات، گەل، شێوان).
(٢) خەڵکی شوێنێك؛ هاووڵاتی شوێنێك.
(٣) زمانی گەلێك یا وڵاتێك. (٤) شێوازێکی تایبەتی.

**Eskimo** (es′kə-mō′), *n.* (١) ئەسکیمۆ: ڕەگەزێکن لە شوێنە زۆر ساردەکانی جیهاندا دەژین وەك پۆڵی بەستەڵەکی باکووری و ئالاسکاو گرینلاندو بەشی ڕۆژهەڵاتی سایبریا. (٢) ئەسکیمۆیەك.
(٣) زمانی ئەسکیمۆ
*adj.* تایبەتی بە ئەسکیمۆو زمانەکەیان.

**esophagus** (i-sof′ə-gəs), *n.* سورێنچکە؛ سورێنچك.
**-esophageal** *(adj.).*

**esoteric** (es′ə-ter′ik), *adj.* (١) تەنها چەند کەسێك لێی تێ دەگەن؛ بۆ ژمارەیەکی کەم و تایبەتی‌یە (بیروباوەڕ، ڕێباز، نووسراو).
(٢) شاراوە؛ نەبینراو؛ نهێنی.

**espalier** (e-spal′yēr), *n.* (١) چوارچێوەیەکە بۆ پیاهەڵگەڕانی ڕووەك.
(٢) داڵیت؛ ڕووەکی هەڵگەڕاو بە چوارچێوەیەکدا.
*v.t.* (١) ڕاهێنانی ڕووەك بۆ هەڵگەڕان بە چوارچێوەیەکدا.
(٢) دروستکردنی چوارچێوەیەك بۆ ڕووەك پیاهەڵگەڕان.

**especial** (ə-spesh′əl), *adj.* نایاب؛ زۆر چاك؛ تایبەتی.

**especially** (ə-spesh′ə-li), *adv.* بەتایبەتی.

**Esperanto** (es′pə-rän′tō, es′pə-ran′tō), *n.* ئەسپیرانتۆ: زمانێکی دروستکراوی جیهانی‌یە بنچینەکەی لەسەر ئەو وشانە دانراوە کە لە زۆربەی زمانە ئەوروپایی‌یەکاندا هەیە (ساڵی ١٨٨٧ دانراوەو وشەکە خۆیشی مانای " هیوا " یە).

**espionage** (es′pi-ə-nij), *n.* (١) سیخوڕی؛ جاسووسی؛ سووسەکردن.
(٢) سووسەکردن بەتایبەتی بۆ مەبەستی سوپایی.

**espousal** (i-spou′z'l), *n.* (١) *(pl.)* ، (ا) دیاری کردن؛ نیشانەکردن؛ مارەکردن. (ب) شایی. (٢) بڕوابوون بە ڕێباز یا بیروباوەڕێك و پاڵپشتی کردنی

**espouse** (i-spouz′), *v.t.* (١) ژنهێنان؛ مارەکردن. (٢) دان بە شوو.
(٣) لایەنگری کردن (بیروباوەڕ، ڕێباز، مەسەلە)؛ لەسەرکردنەوە؛ پاڵپشتی کردن: *( to ~ an idea)*

**espy** (ə-spī′), *v.t.* بەدی کردن؛ بینین؛ سووسەکردن.

**Esq., Esqr.,** = **Esquire.**

**-esque** (esk), پاشگرێکە بەمانای: وەك؛ ~ ئاسا؛ لێچوو؛ ~ ئاسایی:
*( picturesque; statuesque; Romanesque; arabesque)*

**esquire** (ə-skwīr′), *n.* (١) شاگردی سوارچاك (لە ئینگلتەرە).
(٢) بەگزادەیەکی ئینگلیزی کە پلەیەك لەخوار سوارچاکەوەیە.
(٣) خاوەن زەوی‌وزارێکی لادێ
(٤) [E-]، نازناوێکە بۆ ڕێزلێنان لەدوای ناوەوە دەنووسرێت و ماناکەی وەك " .Mr " وایە (کورت دەکرێتەوە بۆ .Esq یا .Esqr ).
(٥) ئاوەڵ (بەتایبەتی پیاوێك کە لەگەڵ ژنێکدا دەچێتە دەرەوە تاکو ژنەکە بەتەنها نەبێت).
*v.t.* (١) شاگردی کردنی سوارچاکێك
(٢) پلەوپایە بەرزکردنەوە بۆ " سوارچاك " .
(٣) بانگ کردن بە نازناوی " Esquire " .
(٤) ئاوەڵی کردن (هی ئافرەت لە چوونەدەرەوەدا).

**-ess** (is, əs), پاشگرێکە نیشانەی مێینەی ئەو توخمەیە، واتا مانای " مێینە " یە: *( actress; countess; lioness)* .

**essay** (ə-sā′, e-sā′), *v.t.* (١) تاقیکردنەوە. (٢) هەوڵدان؛ تەقەلاکردن.
*n.* (١) (e-sā′) ، (ا) تاقیکردنەوەیەك. (ب) هەوڵدانێك؛ تەقەلا.
(٢) (es′ā) ، ووتار؛ ووتاری نووسراوە.

**essayist** (es′ā-ist, es′i-ist), *n.* ووتارنووس؛ پەخشاننووس

**essence** (es′'ns), *n.* (١) گەوهەر؛ ناوکرۆك؛ پوختە؛ نەژاد؛ ماك؛ کاکڵ.
(٢) پوختە، پاڵاوتە، یا ڕۆنی شتێك (ڕووەك، خواردەمەنی).
(٣) ئەم پوختەیە یا ڕۆنە لە کحولدا. (٤) گوڵاو؛ بۆن؛ بۆندار.
(٥) سرووشتی بنچینەیی یا ناوەوەی شتێك؛ ماك.
**in essence,** لە ڕاستیدا؛ لە گەوهەردا؛ لە بنچینەدا.
**of the essence,** زۆر گرنگ؛ زۆر پێویست:
*( Time is of the essence.)*

**essential** (ə-sen′shəl), *adj.* (١) بنچینەیی؛ بناغەیی؛ بنەڕەتی:
*( There are ~ differences between socialism and capitalism.)*
(٢) تەواو؛ پوختە؛ بێ ناتەواوی: *( ~ happiness)* .
(٣) زۆر گرنگ؛ زۆر پێویست؛ پێویست: *( Water is ~ to life.)*
(٤) پوختەی ڕووەك، دەرمان، یا خواردەمەنی‌یەك: *( an ~ oil)* .
*n.* شتێکی زۆر گرنگ یا پێویست؛ شتێکی بنچینەیی یا بناغەیی.

**essentially** (ə-sen'shəl-i), ***adv.*** له راستیدا؛ له گەوهەردا؛ له بنچینەدا.

**-est** (ist, əst), پاشگرێکه بەمانای: (١) هەرە؛ – ترین
***( smallest, biggest, greatest)***
(٢) نیشانەی شێوەی کۆنی کرداری کەسی دووەمی تاکه له رانەبردوودا:
***( goest)***

**E.S.T.**, = Eastern Standard Time.

**establish** (ə-stab'lish), ***v.t.*** (١) چەسپاندن؛ جێگیرکردن.
(٢) (ا) دانان لەسەر کار (فەرمانبەر)؛ دامەزراندن (ب) دانان (یاسا)؛ دارشتن.
(٣) دامەزراندن (بازرگانی، فەرمانڕەوایی، وولات)؛ دانان؛ پێکهێنان؛ دروستکردن (٤) کڵێسه کردن بە دەزگای فەرمانڕەوایی.
(٥) دانان و جێگیرکردن (تیۆری، بیروباوەڕ).
(٦) سەلماندن (دادگا): ***( The plaintiff ~ed his case.)***

**established church,** کڵێسەی فەرمانڕەوایی؛ کڵێسەیەك کە میری دایناببێت بە کڵێسەی سەرەکی میللی و پشتگیری بکات (بەتایبەتی کڵێسەی ئەنگلیکانی له ئینگلتەرە).

**establishment** (ə-stab'lish-mənt), ***n.*** (١) دانان؛ چەسپاندن؛ دامەزراندن؛ پێکهێنان؛ دروستکردن.
(٢) دامەزران؛ چەسپین؛ پێکهاتن؛ دروستبوون.
(٣) شتێکی دامەزراو یا پێکهێنراو (دەزگای بازرگانی یا رامیاری یا کۆمەڵایەتی، سوپا، خێزان... هتد).

**the Establishment,** (١) کڵێسەی ئەنگلیکانی له ئینگلتەرە.
(٢) کڵێسەی " پرێسبیتیریان " له سکۆتلەندە
(٣) کڵێسەی ئەنگلیکانی خێزانی شاهەنشاو چینی بەگزادەکان له ئینگلتەرە.
(٤) کاربەدەستانی وولات، دەزگا، کۆمەڵ، یا رێکخراوێك.

**estate** (ə-stāt'), ***n.*** (١) دۆخ؛ قۆناغێکی ژیان.
(٢) چینێکی کۆمەڵایەتی بەدەسەلات له کۆندا (بەتایبەتی چینی بەگزادەو پیاوە ئاینییەکان و چینی بورجوازی). (٣) سامان؛ سەرمایە.
(٤) میراتی؛ سەرجەمی لەپاش بەجێماوی مردوویەك بە سامان و قەرزەوە.
(٥) خانووبەرە؛ زەوییەکی گەورە کە کۆشکێکی گەورەو خۆشی تێدابێت؛ زەوی‌وزار؛ خانوو زەوی‌وزار؛ موڵك
(٦) [Archaic] (ا) دەوڵەمەندی؛ پلەی سامانداری.
(ب) خۆبادان بە سامانەوە؛ خۆنواندن.

**the fourth estate,** رۆژنامەگەری یا رۆژنامەچییان (واتە چوارەم چینی بەدەسەلاتی کۆمەڵ) (ژمارە دووی ووشەی پێشوو ببینە).

**esteem** (ə-stēm'), ***v.t.*** (١) رێزگرتن؛ رێزلێنان:
***( Ability is always ~ed.)***
(٢) دانان؛ وا دانان؛ بەو چاوە سەیرکردن:
***( We ~ this theory useless.)***
***n.*** (١) رێز؛ رێز بۆ بوون؛ رێزگرتن: ***( He is held in high ~ .)***
(٢) [Archaic] را؛ گۆترە؛ خەملاندن.

**esthete, aesthete** (es'thēt), ***n.*** جوانیناس (بەتایبەتی له هونەردا).

**esthetic, aesthetic** (es-thet'ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە جوانیناسی له هونەردا (٢) هی جوانی (٣) تایبەتی بە لێکۆڵینەوەو فەلسەفەی جوانی؛ تیۆری هونەرە جوانەکان و چۆنێتی هەڵسەنگاندنیان لەلایەن جەماوەرەوە.

**esthetically, aesthetically** (es-thet'i-k'l-i, es-thet'ik-li), ***adv.*** (١) لەرووی جوانیناسییەوە؛ لەرووی جوانییەوە
(٢) بەشێوەیەك کە بایەخ بە جوانی بدرێت.

**esthetician, aesthetician** (es'thə-tish'ən), ***n.*** زانای تیۆری و لێکۆڵینەوەی جوانیناسی؛ زانای جوانیناسی؛ جوانیناس.

**estheticism, aestheticism** (es-thet'ə-siz'm), ***n.*** جوانی و هونەرپەرستی؛ بیروباوەڕی جوانیناسی و هونەرناسی؛ خۆشەویستی جوانی و هونەر

**esthetics, aesthetics** (es-thet'iks), ***n.pl.*** [constructed as sing.], جوانیناسی (بەتایبەتی له هونەردا)؛ فەلسەفەو لێکۆڵینەوەی جوانیناسی له هونەردا.

**estimable** (es'tə-mə-b'l), ***adj.*** (١) هەڵسەنگێنرێت؛ دەخەملێنرێت؛ دەشێت بۆ قەبلاندن (٢) شایانی رێزە.
-estimably *(adv.)*.

**estimate** (es'tə-māt'), ***v.t.*** (١) نرخ لەسەر دانان؛ نرخ بۆ دانان.
(٢) هەڵسەنگاندن؛ خەملاندن؛ قەبلاندن؛ وا دانان:
***( We ~d that it would take a month to finish the work.)***
***n.*** (١) هەڵسەنگاندن (بەتایبەتی هی کارێك لەلایەن کرێکارەکەوە دەربارەی چەند تێچوونی کارەکە)؛ خەمڵ؛ قەبلاندن. (٢) تۆمارکردنی ئەم هەڵسەنگاندنە
(٣) نرخ بۆ دانان؛ نرخ لەسەر دانان. (٤) را؛ بۆچوون.

**estimation** (es'tə-mā'shən), ***n.*** (١) هەڵسەنگاندن؛ قەبلاندن؛ خەمڵ. (٢) را. (٣) رێز؛ رێزگرتن؛ رێزلێنان

**estimator** (es'tə-mā'tēr), ***n.*** هەڵسەنگێنەر؛ قەبلێنەر؛ خەملێنەر؛ نرخ بۆ دانەر.

**estivate** (es'tə-vāt'), ***v.i.*** (١) هاوین بردنە سەر.
(٢) سڕبوون له هاویندا؛ هاوین بردنەسەر بە سڕی.
-estival *(adj.)*; estivation *(n.)*.

**estop** (e-stop'), ***v.t.*** بەرگرتن؛ وەستاندن؛ رێگەلێگرتن؛ نەهێشتن.

**estrange** (ə-strānj'), ***v.t.*** لێ کردن؛ لێ تەکاندنەوە؛ لەیەك کردن؛ لێ دوورخستنەوە؛ ئاوارەکردن؛ وەك بێگانە لێکردن:
***( He ~d his friends by behaving foolishly.)***

**estrangement** (ə-strānj'mənt), ***n.*** لەیەکتربوون؛ لەیەك تەکینەوە؛ لەیەك دووركەوتنەوە؛ ئاوارەبوون؛ وەك بێگانە لێهاتن؛ تەرەبوون؛ ئاوارەیی
***( to cause an ~ between a husband and wife or between two old friends)***

**estuary** (es'choo-er'i), ***n.*** ئاوەڕێژ؛ ئاوڕێژ؛ رێژگە

**-et** (it, ət), پاشگرێکە بەمانای: بچکۆلە. ***( islet; eaglet; ringlet)***

**etc.,** et cetera.

**et cetera, et caetera** (et set'ēr-ə, et set'rə), وە ئەوانی تر؛ هەتا دوایی؛ وە هەروەها؛ هتد.

**etch** (ech), ***v.t. & v.i.*** (١) کڵێشە یا نەخشەهەڵکەندن لەسەر کانزا یا شووشە. (٢) وێنەکردن؛ وێنە دروستکردن.
(٣) له مێشکدا هەڵکەنران؛ له مێشکدا چەسپ بوون:
***( The memory of that day is ~ed in my memory forever.)***

**etching** (ech'iŋ), ***n.*** (١) هەڵکەندنی کڵێشە یا نەخشە لەسەر تەبەقی کانزا یا شووشە؛ وێنە دروستکردن.
(٢) تەبەقە کانزا یا شووشەیەکی کڵێشە لەسەر هەڵکەنراو.
(٣) وێنەیەکی ئەم کڵێشە یا نەخشە هەڵکەنراوە لەسەر کاغەز؛ وێنە

**eternal** (i-tūr'n'l), ***adj.*** نەمر؛ هەتا هەتا؛ هەمیشەیی.

**the Eternal,** خودا.

**eternalize** (i-tūr'n'l-īz'), ***v.t.*** چەسپاندن بۆ هەتا هەتا؛ هەمیشەیی کردن؛ کردن بە نەمر یا هەتا هەتا.

**eternally** (i-tūr'n'l-i), ***adv.*** هەتا هەتا.

**eternity** (i-tūr'nə-ti), ***n.*** (١) هەتا هەتا؛ نەمری؛ هەمیشەیی.
(٢) کاتێکی زۆر دوورودرێژ؛ کاتێکی بێ پایان: ***( an ~ of waiting)***
(٣) ئەوەو دنیا

**-eth** (əth, ith), پاشگرێکە ژمارەی ریزی یا پلەیی لێ دروست دەکرێت لەو ژمارانەی بە تیپی بزوێن کۆتاییان دێت و ماناکەیشی (– هەمین)ە
***( fortieth, fiftieth)***

**ether** (ē'thēr), ***n.*** (١) ئاسمان؛ ئاسمانی روون. (٢) [Rare] ، هەوا.
(٣) ئاوێتەیەکی کیمیایی.
(٤) ماددەیەکی نەبینراوە له هەوادا گوایە شەپۆلی رووناکی و شتی تر دەگەیەنێت (فیزیا).

**ethereal** (i-thēr'i-əl), ***adj.*** (١) زۆر ناسك؛ سووك و ناسك:
***( the ~ grace of her dancing)***

(٢) ئاسمانی؛ بەرز؛ پیرۆز؛ تایبەتی بە ئاسمان.
**etherize** (ē′thə-rīz′), *v.t.* (١) کردن بە " ئیسەر "
(٢) بەنج کردن بە گازی " ئیسەر "؛ سڕکردن بە " ئیسەر ".
**ethic** (eth′ik), *n.* ڕەووشت؛ ڕەفتارچاکی؛ ڕەفتاری باش نواندن.
*adj.* ڕەفتار چاك؛ درووست؛ ڕەفتار جوان.
**ethical** (eth′i-k'l), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕەووشت جوانی یا ڕەفتار چاکی؛ تایبەتی بە کردەوەی درووستو جوان.
(٢) درووست؛ پەسەند؛ جوان (ڕەووشت، کردەوە):
*( It is not ~ for a doctor to sleep with his patients.)*
**ethically** (eth′i-k'l-i, eth′ik-li), *adv.* لەڕووی ڕەووشت جوانییەوە؛ لەڕووی ڕەفتارچاکییەوە
**ethics** (eth′iks), *n.pl.* (١) زانستی ڕەووشت جوانی؛ فەلسەفەی ڕەفتار چاکی؛ زانستی خوو ڕەووشت. (٢) ووتارو پەرتووکی دەربارەی زانستی ڕەووشت چاکی (٣) پەیڕەوی ڕەووشت چاکی فەیلەسوفێك، ئاینێك، تاقمێك، یا ئەندامانی پیشەیەك
**ethnic** (eth′nik), *adj.* [Obs.]. (١) گاوور
(٢) ڕەگەزی؛ نەتەوەیی؛ ڕەگەز: *( ~ foods, dances, etc.)*.
-ethnical *(adj.)*; ethnically *(adv.)*.
**ethno-** (eth′nə), پێشگرێکە بەمانای ڕەگەز؛ نەتەوە.
**ethnocentrism** (eth′nə-sen′triz'm), *n.* ڕەگەزپەرستی؛ ڕەگەزی خۆ پەرستی؛ نەتەوەی خۆ پەرستی؛ لەخۆبایی ڕەگەزی.
**ethnogeny** (eth-noj′ə-ni), *n.* زانستی بنچینەی ڕەگەزو ڕەگەزایەتی.
**ethnographer** (eth-nog′rə-fēr), *n.* زانای نیشانەکانی نەتەوە
**ethnography** (eth-nog′rə-fi), *n.* ئەتنوگرافیا؛ زانستی نیشانەکانی نەتەوە (ەتایبەتی نەتەوە سەرەتاییەکان).
-ethnographic *(adj.)*; ethnographically *(adv.)*.
**ethnology** (eth-nol′ə-ji), *n.* ئەتنۆلۆجی؛ زانستی ڕەگەزەکان یا نەتەوەکانو پەیوەندییان لەگەڵ یەکتریداو نیشانەکانیانو جۆری دابەشبوونیان بەسەر جیهانداو خوو نەریتیان.
-ethnologic *(adj.)*; ethnological *(adj.)*; ethnologically *(adv.)*.
**ethnologist** (eth-nol′ə-jist), *n.* نەتەوەناس؛ ڕەگەزناس؛ زانای نەتەوەو پەیوەندییان لەنێوان یەکتریداو نیشانەکانیانو جۆری دابەشبوونیانو خوو نەریتیان.
**ethos** (ē′thos), *n.* (١) نیشانەو خوو نەریتو هەڵوێستی کۆمەڵێکی نەتەوەیی، پیشەیی، یا ڕامیاری
(٢) نیشانە گشتییەکانی بەرهەمێکی هونەری.
**ethyl** (eth′əl), *n.* (١) ئیثل؛ ماددەیەکی کیمیاییە
(٢) (ا) ئاوێتەیەکی قوڕقوشمی بێ ڕەنگی ژەهراوییە.
(ب) جۆرە بەنزینێکە کە ئەم ئاوێتە قوڕقوشمییەی تێ دەکرێت.
**etiology** (ē′ti-ol′ə-ji), *n.* (١) زانستی هۆ یا سەرچاوەی شت.
(٢) زانستی هۆ یا سەرچاوەی نەخۆشی؛ زانستی نەخۆشی.
-etiological *(adj.)*.
**etiquette** (et′i-ket′, et′i-kət), *n.* ڕەووشت جوانی؛ ڕەفتاری پەسەند (لەنێوان خەڵکدا یا لە پیشەیەکدا)؛ دەستووری ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکدا (لە ژیانی کۆمەڵایەتی یا پیشەییدا).
**etymological** (et′ə-mə-loj′i-k'l), *adj.* هی ووشەوانی؛ تایبەتی بە زانستی سەرچاوە یا بنجوبناوانی ووشە
-etymologically *(adv.)*.
**etymologist** (et′ə-mol′ə-jist), *n.* زانای ئیتمۆلۆجی؛ سەرچاوە یا بنجوبناوانی ووشە
**etymology** (et′ə-mol′ə-ji), *n.* ئیتمۆلۆجی؛ سەرچاوەو گۆڕینی ووشە؛ زانستی دۆزینەوەی سەرچاوەی ووشەو گۆڕینی؛ زانستی بنجوبناوانی ووشە (زمانەوانی)
**eu-** (ū, yoo), پێشگرێکە بەمانای باش؛ چاك؛ جوان
*( eulogy; euphemism)*

**eucalypt, eucalyptus** (ū′kə-lipt′), *n.* یوکالیپتۆس: درەختێکی هەمیشە سەوزە کەڵکی دارو جیوەو دەرمانی لێ وەردەگیرێت.
**Eucharist** (ū′kə-rist), *n.* (١) شێوی خواهانە (لە کلێسەدا).
(٢) ئەو نانو شەرابە پیرۆزکراوەی لەم شێوەدا دەخورێتو دەخورێتەوە.
**eugenic** (yoo-jen′ik), *adj.* تایبەتی بە چاك کردنی تۆخمی وەچەی مرۆڤ؛ تایبەتی بە بوونی منداڵی تەندروست.
-eugenically *(adv.)*; eugenicist *(n.)*.
**eugenics** (yoo-jen′iks), *n.pl.* زانستی چاك کردنی تۆخمی وەچەی مرۆڤ.
**eulogist** (ū′lə-jist), *n.* لاوێنەرەوە بە ووتار یا هەڵبەست؛ بە مردوودا هەڵدەر بە ووتار یا هۆنراوە.
**eulogize** (ū′lə-jīz′), *v.t.* ستایش کردن (پاش مردن)؛ لاواندنەوە بۆ کەسێك بە ووتار یا هەڵبەست پاش مردنی؛ شیوەن کردن بۆ تازە مردوو بە ووتار یا هەڵبەست.
**eulogy** (ū′lə-ji), *n.* (١) شین کردن بۆ تازە مردوویەك (بە ووتار یا هەڵبەست)؛ شیوەن؛ لاواندنەوە (بە ووتار یا هۆنراوە).
(٢) ستایش کردن.
**eunuch** (ū′nək), *n.* پیاوی خەساو؛ پیاوی خەسێنراو.
**euphemism** (ū′fə-miz'm), *n.* (١) جوانی دەربڕین؛ دەربڕینی شتێکی ناپەسەند یا ناشرین بە ووشەی جوان؛ ووشە خستنە قاڵبێکی جوانەوە؛ جوانکردنی ووتەی ڕەق.
(٢) ووشەیەکی ناسك؛ ووشەیەکی جوانو ناسك کە شتێکی ناپەسەند دەربڕێت
-euphemist *(n.)*; euphemistic *(adj.)*; euphemistically *(adv.)*; euphemize *(v.t.)*.
**euphonic** (yoo-fon′ik), *adj.* خۆش (دەنگ)؛ هاوئاواز؛ ساز (دەنگ).
**euphonious** (yoo-fō′ni-əs), *adj.* = euphonic.
**euphonium** (yoo-fō′ni-əm), *n.* زوڕنا.
**euphony** (ū′fə-ni), *n.* (١) خۆشی دەنگ؛ خۆشیو دڵگیری ئاواز؛ سازینو خۆشی چەند ئاوازێك. (٢) ئاسان کردنو خۆش ئاوازی ووتەبێژی.
**euphorbia** (yoo-fôr′bi-ə), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکە شیلەیەکی سپیو خەستی تێدایە.
**euphoria** (yoo-fôr′i-ə, yoo-fō′ri-ə), *n.* کەشکە؛ کەشکەداری؛ ئەوپەڕی خۆشحاڵی.
**euphoric** (yoo-fôr′ik, yoo-for′ik), *adj.* کەشکەدار؛ زۆر خۆشحاڵ: *( They were ~ over the good news.)*.
**Euphrates** (ū-frā′tēz), *n.* ڕووباری فورات.
**euphuism** (ū′fū-iz'm), *n.* ڕازاندنەوەی دەستکردی لە ڕادە بەدەری نووسین یا دووان.
-euphuist *(n.)*; euphuistic *(adj.)*.
**Europe** (yoor′əp), *n.* ئەورووپا.
**European** (yoor′ə-pē′ən), *adj.* ئەورووپایی: گەل، کلتوور، یا شتی ئەورووپا.
*n.* ئەورووپاییەك؛ کەسێکی ئەورووپایی.
**Europeanize** (yoor′ə-pē′ən-īz′), *v.t.* وەك ئەورووپایی لێکردن (لە خوو نەریتو جلوبەرگو کلتووردا).
**euthanasia** (ū′thə-nā′zhə, ū′thə-nā′zhi-ə), *n.* (١) مردنی بێ ئازار. (٢) کوشتنی بێ ئازاری نەخۆشێك کە هیوای چاکبوونەوەی لێ نەکرێتو هیچ چارێکی نەبێت.
**euthenics** (yoo-then′iks), *n.pl.* زانیاری چاك کردنی باری ژیانی مرۆڤ بە چاك کردنی دەورووبەرەکەی.
**evacuate** (i-vak′ū-āt′), *v.t.* (١) بەتاڵ کردنەوە؛ بەتاڵ کردن.
(٢) خۆ خاڵی کردنەوە؛ میزو گوو کردن. (٣) لابردن.
(٤) کشانەوە (سەنگەر، شوێنێکی داگیرکراو، شوێنێکی مەترسی لێکراو لەبەر ئاگر، لافاو، یا بوومەلەرزە... هتد)؛ چۆڵ کردن؛ بەجێهێشتن.
*v.i.* خۆکشانەوە (شارێکی چواردەور گیراو)؛ چۆڵ کردن.

-evacuator *(n.).*
**evacuation** (i-vak´ū-ā′shən), *n.* (١) بەتاڵ کردنەوە؛ بەتاڵ بوونەوە. (٢) میزکردن؛ گووکردن. (٣) (ا) خاڵی کردنەوەی نەخۆشێك لەلایەن پزشکەوە. (ب) ئەو میز یا پیسایییەی بەم جۆرە لابدرێت. (٤) کشانەوەی سوپا لە سەنگەر یا شارێك؛ کشانەوەی دانیشتووانی شار یا دێیەك (بەهۆی مەترسی جەنگ، ئاگر، لافاو، بوومەلەرزە، یا کارەساتی ترەوە).
**evacuee** (i-vak´ū-ē′, i-vak′ū-ē´), *n.* کەسێکی کشاوە یا کشێنراوە (لە شوێنێکی پڕ مەترسی).
**evade** (i-vād′), *v.i.* (١) [Rare] ، راکردن؛ دەربازبوون. (٢) خۆ لێ لادان؛ خۆدزینەوە؛ خۆبەدەستەوەنەدان؛ لێ راکردن.
*v.t.* (١) خۆ لێ لادان؛ لەبەردەم لاچوون؛ خۆ دەربازکردن (بە فێڵوتەڵەکە یا زیرەکی) *( to ~ the law)* . (٢) خۆ لێ دزینەوە؛ خۆبەدەستەوەنەدان؛ خۆدزینەوە لە بەرپرسیاری: *( He is ~ing the question (*or *the issue).)*
**evaluate** (i-val′ū-āt´), *v.t.* هەڵسەنگاندن؛ نرخ بۆ دانان
**evaluation** (i-val´ū-ā′shən), *n.* هەڵسەنگاندن؛ خەمڵ کردن؛ خەمڵ؛ نرخ بۆ دانان.
**evanesce** (ev′ə-nes´), *v.i.* زوو بەسەرچوون؛ لەچاو وون بوون؛ نەمان.
**evanescence** (ev´ə-nes′'ns), *n.* زوو بەسەرچوون؛ لەچاو وون بوون؛ زوو نەمان یا دوایی هاتن.
**evanescent** (ev´ə-nes′'nt), *adj.* زوو بەسەرچوو؛ سەردەمی؛ کەم خایەن.
**evangel** (i-van′jəl), *n.* (١) مژدە؛ مژدەی خۆش؛ دەنگوباسی خۆش. (٢) [-E]، ئینجیل؛ یەکێك لە بەشەکانی ئینجیل (٣) مژدەدەر (ئاین)؛ پێ راگەیێنی ئاینی خاچ پەرستی.
**evangelical** (ē´van-jel′i-k'l), *adj.* (١) تایبەت بە ئینجیل یا یەکێك لە بەشەکانی. (٢) تایبەتی بە هەندێك لە لقەکانی ئاینی پرۆتستانت کە دەڵێن چوونە بەهەشت لەسەر بڕوا بوون بە عیسا بەندە نەك کردەوەی چاك لەم ژیانەدا. (٣) تایبەتی بە پێ راگەیاندنی ئاینی خاچ پەرستی.
-evangelically *(adv.).*
**evangelism** (i-van′jə-liz'm), *n.* (١) پێ راگەیاندنی ئاینی خاچ پەرستی بە توندوتیژیو کوێرانە. (٢) کاری پێ راگەیێنێکی وەها.
**evangelist** (i-van′jə-list), *n.* (١) [-E] یەکێك لە چوار نووسەرەکەی ئینجیل (٢) پێ راگەیێنی ئاینی خاچ پەرستی (بەتایبەتی گەڕۆك).
-evangelistic *(adj.).*
**evangelize** (i-van′jə-līz´), *v.t.* (١) پێ راگەیاندنی ئاینی خاچ پەرستی (٢) راکێشانە ناو ئاینی خاچ پەرستییەوە؛ کردن بە خاچ پەرست.
-evangelization *(n.).*
**evaporate** (i-vap′ə-rāt´), *v.t.* (١) کردن بە هەڵم (٢) ووشك کردنەوە بە کوڵاندن یا گەرمای ڕۆژ (شیر، سەوزە، میوەهات).
*v.i.* (١) بوون بە هەڵم (٢) هەڵم لێ هەڵسان (٣) نەمان؛ لەچاو وون بوون.
-evaporator *(n.).*
**evaporated milk,** شیری خەستی شیرینی تێ نەکراو.
**evaporation** (i-vap´ə-rā′shən), *n.* (١) بوون بە هەڵم؛ کردن بە هەڵم (٢) ووشك کردنەوە (شیر، سەوزە، میوە).
**evasion** (i-vā′zhən), *n.* (١) خۆدزینەوە (لە ئەرك، پرسیار، بەرپرسیاری، راستییەك) بە فێڵو تەڵەکە یا زیرەکی؛ خۆبەدەستەوەنەدان؛ خۆلادان (٢) ڕێگەی خۆدزینەوە؛ فێڵوتەڵەکە؛ بیانوو.
**evasive** (i-vā′siv), *adj.* (١) چەوت؛ لێڵ؛ دوو مانابەخش؛ بە پێچوپەنا؛ تایبەتی بە ووتەو وەڵامی چەوت *( an ~ answer; ~ talk)* . (٢) خۆبەدەستەوەنەدەر؛ خۆلادەر؛ خۆدەربازکەر: *( an ~ person)* .
**Eve** (ēv), *n.* حەوا
**eve** (ēv), *n.* (١) [Poetic] ، ئێوارە (٢) ڕۆژ یا ئێوارەی پێشی جەژنێك: *( Christmas E~ )* . (٣) ڕۆژ، ئێوارە، شەو، یا سەردەمی پێش ڕوودانێك: *( on the ~ of victory)*
**even** (ē′vən, ē′v'n), *adj.* (١) تەخت؛ ڕێك؛ ساف؛ تەختایی: *( an ~ surface; ~ ground; ~ country)* (٢) یەك نەوا؛ ڕێكوپێك؛ نەگۆڕاو: *( an ~ tempo, beat, pace, etc.)* . (٣) هێمن؛ لەسەرخۆ: *( an ~ temper (*or *disposition) )* . (٤) ڕێك؛ لە ئاستی یەکتر؛ خشت؛ لە یەك ئاست: *( The water was ~ with the rim.)* (٥) هاوتا؛ هاوکێش؛ بەرامبەر. (٦) پاك لە پاك؛ هیچ لە هیچ. (٧) تۆڵە کراوە؛ تۆڵە سەندراو؛ پاك لە پاك. (٨) یەکسان؛ بەرامبەر: *( an ~ exchange)* . (٩) ئەوەندەی یەك (ژمارە، هەند، پلە). (١٠) جووت (ژمارە): *( ten, four, thirty, and twenty-two are ~ numbers.; an ~ number is a number that is exactly divisable by two.)*
*adv.* (١) [Obs.] ، بە ڕێکی؛ بە ڕێكوپێکی یا یەك نەوایی. (٢) (ا) تەنانەت؛ هەتا؛ – یش: *( E~ a fool could understand.)* . (ب) تەنانەت هەر؛ هەر؛ هەر– یش: *( He never ~ opened the letter.)* (٣) بەتەواوی؛ تەواو؛ هەر وەك: *( E~ as I expected.)* . (٤) لە هەمان کاتدا؛ لە کاتێکدا: *( E~ as he spoke I left.)* . (٥) تەنانەت: *( His error was ~ worse.)* .
*v.t.* (١) تەخت کردن؛ ڕێك کردن. (٢) ڕێكوپێك کردن؛ یەك نەوا کردن (٣) هاوتاکردن؛ یەکسان کردن؛ بەرامبەرکردن.
*v.i.* وەك یەك لێهاتن؛ هاوتابوون؛ یەکسان بوون.
break even, [Slang], پاك لە پاك؛ هیچ لە هیچ؛ نە بردنەوەو نە دۆڕان.
even if, ئەگەرچی؛ هەرچەندە؛ لەگەڵ ئەوەشدا.
**even-handed** (ē′vən-han′did), *adj.* بێ لایەن؛ بە ڕەوا؛ یەکسان.
**evening** (ēv′niŋ), *n.* (١) ئێوارە. (٢) دوا قۆناغی ژیان، پیشە، یا شتێکی وەها. (٣) شەو: *( a musical ~ )* .
*adj.* هی ئێوارە؛ بۆ ئێوارە؛ ئێوارەیی.
**evening dress ( or clothes ),** جلی شەو: دەستەجلی چاك کە بە بۆنەی ڕوودانێکی ڕەسمییەوە لەبەردەکرێ.
**evening star,** ئەستێرەی ئێوارە.
**even-minded** (ē′vən-mīn′did), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ ژیر.
**evenness** (ēv′ən-nis), *n.* (١) تەختی؛ ڕێکی؛ سافی. (٢) هاوتایی؛ یەکسانی؛ وەك یەکی. (٣) ڕێكوپێکی. (٤) لەسەرخۆیی؛ هێمنی.
**event** (i-vent′), *n.* (١) ڕوودان؛ ڕووداو؛ بەسەرهات؛ ڕووداوێکی گرنگ. (٢) ئەنجام. (٣) پێشبڕکێیەك لە بەرنامەیەکی وەرزشیدا.
at all events, هەرچۆنێك بێت؛ بە هەر حاڵێك بێت.
in any event, هەرچۆنێك بێت؛ بە هەر حاڵێك بێت.
in the event of, ئەگەر؛ لە حاڵەتێکدا؛ ئەگەر شتێکی وەها بوو.
**even-tempered** (ē′vən-tem′pērd), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ ژیر.
**eventful** (i-vent′fəl), *adj.* (١) پڕ لە ڕووداوی گرنگ: *( an ~ year)* (٢) گرنگ (ئەنجام)؛ گرنگ: *( an ~ conversation)* .
**eventide** (ē′vən-tīd´), *n.* [Archaic or poetic], ئێوارە؛ کاتی ئێوارە.
**eventual** (i-ven′choo-əl), *adj.* (١) دوایی؛ هی دوایی: *( ~ success)* (٢) لەوانەیە.
**eventuality** (i-ven´chōō-al′ə-ti), *n.* ناکاوی؛

لەوانەبوونی ڕوودان *( We must be ready for any ~ies.)* .

**eventually** (i-ven′chōō-ə-li, i-ven′choo-li), *adv.* لەدواییدا

**eventuate** (i-ven′chōō-āt′), *v.i.* بوون بە ئەنجامی ئەوە.

**ever** (ev′ẽr), *adv.* (١) هەمیشە؛ هەر *( He is ~ the same.)* .
(٢) پەیتا پەیتا؛ جار لە دوای جار.
(٣) هەرگیز؛ قەت *( Have you ~ seen an eclipse?)* .

**ever and anon,** [Archaic], جار بە جار؛ جار نە جار؛ ناوبەناو

**ever so,** [Colloq.], زۆر؛ ئێجگار

**forever ( and ever ),** هەتا هەتا

**hardly ever,** زۆر بە دەگمەن؛ کەم جار

**everglade** (ev′ẽr-glād′), *n.* زۆنگاو؛ زۆنگ

**evergreen** (ev′ẽr-grēn′), *adj.* هەمیشە سەوز.
*n.* (١) داری هەمیشە سەوز.
(٢) لق وپۆپی داری هەمیشە سەوز (کە بۆ ڕازاندنەوە بەکاردەهێنرێت).

**everlasting** (ev′ẽr-las′tiŋ, ev′ẽr-läs′tiŋ), *adj.* (١) نەمر؛ هەمیشەیی؛ هەمیشە؛ هەتا هەتایی.
(٢) درێژخایەن؛ زۆرخایەن؛ قایم (جل وبەرگ).
*n.* (١) هەمیشەیی؛ هەتا هەتا. (٢) چەند جۆرە گوڵێکە کە پاش وشك کردنەوەیشی ڕەنگەکەی ناگۆڕێت و هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە.
(٣) جۆرە قوماشێکی قایم.

**the Everlasting,** خودا

**evermore** (ev′ẽr-môr′, ev′ẽr-mōr′), *adv.* هەتا هەتا؛ هەمیشە.

**every** (ev′ri, ev′ẽr-i), *adj.* (١) هەموو؛ هەموو یەکێك لە؛ هەر یەکێك *( ~ man among you; ~ person here)* .
(٢) تەواو؛ هەموو *( He was given ~ chance to do the job.)* .
(٣) هەر *( He comes ~ three days.)* .

**every now and then,** هەر جار نە جارێك؛ جار بە جار؛ ناوبەناو.

**every other,** هەر یەك نا یەکێك:
*( every other day; Write on every other line.)*

**every so often,** [Colloq.], جار نە جار؛ جار بە جار؛ ناوبەناو.

**every which way,** [Colloq.], بە هەموولایەکدا؛ بە شێواوی.

**everybody** (ev′ri-bod′i, ev′ri-bud′i), *pron.* هەمووکەسێك؛ هەمووکەس.

**everyday** (ev′ri-dā′), *adj.* (١) ڕۆژانە؛ هەموو ڕۆژێك:
*( an ~ routine)*
(٢) بۆ هەموو ڕۆژێك یا کاتێك دەشێت: *( ~ shoes)* .
(٣) ئاسایی: *( an ~ occurrence)*

**everyone** (ev′ri-wun′, ev′ri-wən), *pron.* هەمووکەسێك؛ هەمووکەس.

**every one,** (١) هەمووکەسێك.
(٢) هەموو دانە کەسێك یا شتێك؛ هەر یەکە.

**everything** (ev′ri-thiŋ′), *pron.* (١) هەموو شتێك؛ هەموو شت.
(٢) هەموو شتێکی پەیوەندیدار.
(٣) گرنگترین شت *( Money is ~ to some people.)* .

**everywhere** (ev′ri-hwâr′), *adv.* لە هەموو شوێنێك؛ هەموو شوێنێك

**evict** (i-vikt′), *v.t.* (١) گەڕاندنەوە یا دەستکەوتنەوەی زەوی وزار یا خانوو (بە بڕیاری دادگا). (٢) دەرکردنی کرێچی (لەسەر بڕیاری دادگا لەبەر کرێ نەدان یا پەیمان شکاندن).

**eviction** (i-vik′shən), *n.* دەرکردنی کرێچی (لەسەر بڕیاری دادگا لەبەر کرێ نەدان یا پەیمان شکاندن):
*( He gave the tenants the ~ notice.)*

**evidence** (ev′ə-dəns), *n.* (١) دیاربوون؛ ڕوونی. (٢) نیشانە.
(٣) بەڵگە. (٤) (ا) گەواهی. (ب) گەواه (دادگا).
*v.t.* (١) ڕوونکردنەوە؛ پیشاندان؛ دەرخستن.
(٢) گەواهی دان؛ شایەتی دان.

**in evidence,** دیار؛ ئاشکرا؛ لەڕوو.

**turn state's evidence,** گەواهی دان دژی هاوتاوان.

**evident** (ev′ə-dənt), *adj.* دیار؛ ئاشکرا؛ ڕوون؛ لەڕوو.

**evidently** (ev′ə-dənt-li, ev′ə-dent′li), *adv.* وا دیارە؛ لەوە دەچێت؛ ئاشکرایە؛ دیارە.
*( He had ~ been working very hard.)*

**evil** (ē′v'l), *adj.* (١) بەد (کردار، ڕەوشت)؛ پیس (ڕەفتار)؛ خراپ (کردەوە). (٢) زیانبەخش.
(٣) بە وەی؛ بەدبەخت: *( an ~ hour)* .
(٤) پیس؛ بۆگەن (ناوبانگ): *( an ~ reputation)* .
*n.* (١) بەدی؛ خراپە؛ کردەوەی خراپ: *( to do no ~ )* .
(٢) وەی؛ شتێکی بە وەی، خراپ، بەد، یا زیانبەخش.
(٣) [Obs.]، جۆرە نەخۆشییەکی پێستە.

**-evilly** *(adv.)*; **evilness** *(n.)*.

**the Evil One,** شەیتان.

**evil-doer** (ē′v'l-dōō′ẽr), *n.* بەدکار؛ بەدکردار؛ خراپەکەر؛ پیاوخراپ.

**evil eye,** چاوپیس؛ چاوپیسی.

**evil-minded** (ē′v'l-mīn′did), *adj.* (١) بەد؛ بەدکار؛ پیس.
(٢) بەدنیاز؛ شت بە خراپ لێکدەرەوە.

**evince** (i-vins′), *v.t.* پیشاندان (هەست، خواست)؛ دەرخستن (هەستی کەسی): *( He ~d his desire to go home.)* .

**-evincible** *(adj.)*.

**eviscerate** (i-vis′ə-rāt′), *v.t.* (١) ڕیخۆڵە یا ناوسك دەرهێنان.
(٢) هەناو لێ بڕین؛ هێز لێ بڕین؛ بەشێکی گرنگ لێکردنەوە.

**evitable** (ev′ə-tə-b'l), *adj.* خۆی لێ لادەدرێت؛ دەتوانرێت خۆی لێ لابدرێت.

**evocation** (ev′ō-kā′shən), *n.* بانگ کردن؛ پەیداکردن؛ هێنانەڕوو (گیانی مردوو، جنۆکە).

**evocative** (i-vok′ə-tiv, i-vō′kə-tiv), *adj.* هەست جووڵێنەر.

**evoke** (i-vōk′), *v.t.* (١) هێنانەڕوو (گیانی مردوو، جنۆکە)؛ بانگ کردن؛ پەیداکردن: *( to ~ a spirit from the other world)* .
(٢) (ا) هەست جووڵاندن؛ پەیداکردن (هەست): *( to ~ a smile)*
(ب) هێنانە بەرچاو؛ هێنانەڕوو؛ جووڵاندن و هێنانە پێشەوە:
*( to ~ memories of the past)*

**evolution** (ev′ə-lōō′shən, ev′'l-ū′shən), *n.* (١) گۆڕانی زیندەوەر؛ پەیدابوون و گۆڕانی وردە وردەی زیندەوەر؛ بار گۆڕین (زیندەوەر).
(٢) پەرەسەندن؛ پێشکەوتن؛ گۆڕانی وردە وردە (بیروباوەڕ، کردەوە، زیندەوەر)؛ گۆڕین؛ بار گۆڕین. (٣) ڕەگ دۆزینەوە (بیرکاری).
(٤) مناوەرەی سوپایی و هێزی دەریایی.

**evolutionary** (ev′ə-lōō′shən-er′i), *adj.* (١) تایبەتی بە تیۆری پەیدابوون و گۆڕانی زیندەوەر. (٢) تایبەتی بە بار گۆڕان و پەرەسەندن.

**evolutionist** (ev′ə-lōō′shən-ist, ev′'l-ū′shən-ist), *n.* –(١) کەسێك کە بڕوای هەبێت بە تیۆری پەیدابوون و گۆڕانی زیندەوەر.
(٢) کەسێك کە بڕوای هەبێت بە پێشکەوتنی بەرەبەرەی کۆمەڵ لەڕێگەی ئاشتییەوە نەك شۆڕش

**evolve** (i-volv′), *v.t.* (١) گۆڕینی وردە وردە.
(٢) لێ هاتنە دەرەوە (بۆن، گاز، هەڵم... هتد)؛ لێ هێنانە دەرەوە
(٣) بار گۆڕینی وردە وردەی زیندەوەر.
*v.i.* (١) گۆڕانی وردە وردە؛ پەرەسەندن؛ پێشکەوتن بەرە بەرە.
(٢) دەرکەوتن؛ هاتنەڕوو.

**-evolvement** *(n.)*.

**evulsion** (i-vul′shən), *n.* لە ڕەگ دەرهێنان؛ لێ دەرهێنان یا لێکردنەوە بەزۆر.

**ewe** (ū), *n.* مەڕ.

**ewer** (ū′ēr), *n.* مەسینە

**ex** (eks), *prep.* بەبێ: *( ~ interest)* .

**ex-** (eks), پێشگرێکە بەمانای: (١) (ا) لە دەرەوە؛ بۆ دەرەوە؛ لە:

*( expel, export, exempt)*

(ب) بەولاوە؛ لەوە بەولاوە: *( excess)* .

(ج) بەتەواوی *( exterminate)* .

(٢) پێشوو؛ هی پێشوو؛ بەر لە ئێستا:

*( ~ -president; ~ -husband; ~ - convict; ~ -wife)*

**exacerbate** (ig-zas′ēr-bāt′, ik-sas′ēr-bāt′), *v.t.* (١) زیادکردن

یا خراپتر کردن (ئازار، نەخۆشی، تووڕەیی، ناخۆشی، بار)؛ توندوتیژتر کردن.

(٢) پەستکردن؛ زویرکردن؛ تووڕەکردن؛ وورووژاندن.

-**exacerbation** *(n.).*

**exact** (ig-zakt′), *adj.* (١) ڕاست؛ تەواو؛ کتومت.

(٢) وورد؛ ڕاست

(٣) توندوتیژ *( an ~ disciplinarian)*

*v.t.* (١) ( ~ from; ~ of ) ، بەزۆر لێ سەندن؛ لێ سەندن؛ داوالێکردن.

(٢) پێویست کردن؛ ویستن.

**exacting** (ig-zak′tiŋ), *adj.* (١) توندوتیژ؛ گران (مامۆستا)؛

بە هیچ ڕازی نەبوو *( an ~ teacher)* .

(٢) گران (کار، فرمان)؛ قورس: *( an ~ job)* .

**exaction** (ig-zak′shən), *n.* (١) بەزۆر لێ سەندن (پارە، کات، یارمەتی).

(٢) شتێکی بەزۆر لێ سەنراو (باج، سەرانە، مز).

**exactitude** (ig-zak′tə-tōōd′, ig-zak′tə-tūd′), *n.* ووردی؛

تەواوی؛ ڕاستی؛ بێ هەڵەیی

**exactly** (ig-zakt′li), *adv.* (١) بەتەواوی؛ تەواو؛ بە ڕاستی؛ بە ووردی؛

کتومت؛ دەقاودەق (٢) بەڵێ؛ وایە؛ تەواوە؛ ڕاستە.

**exaggerate** (ig-zaj′ə-rāt′), *v.t. & v.i.* پێ لێ هەڵبڕین؛ دانەدەم؛

زیادە ڕۆین؛ زیادە پێوەنان؛ فشەکردن؛ فیشاڵ لێدان.

-**exaggerator** *(n.).*

**exaggerated** (ig-zaj′ə-rā′tid), *adj.* زیادە پێوەنراو؛ زل کراو؛

پێ لێ هەڵبڕاو

**exaggeration** (ig-zaj′ə-rā′shən), *n.* پێ لێ هەڵبڕین؛ دانەدەم؛

زیادەڕۆیی؛ زیادە پێوەنان؛ فشە؛ فشەکردن.

**exalt** (ig-zôlt′), *v.t.* (١) شکۆپێدان؛ پلەوپایە بەرزکردن؛ ڕێزلێنان؛

بڵندکردن (٢) ستایش کردن؛ بە شان و باڵدا هاتن.

(٣) گەشکەدارکردن؛ گەشکەپێدان؛ شەیداکردن.

(٤) توندوتیژ کردن (ڕەنگ)

**exalted** (ig-zôl′tid), *adj.* (١) پایە بەرز؛ شکۆدار؛ بەشکۆ

(٢) بەرز؛ بڵند

**exaltation** (eg′zôl-tā′shən), *n.* (١) شکۆپێدان؛ پایە بەرزکردنەوە؛

شکۆ؛ پایە بەرزی (٢) گەشکە؛ شەیدایی؛ ئەوپەڕی خۆشی و شانازی.

**exam** (ig-zam′), *n.* [Colloq.]. = **examination.**

**exam.**, = **examination.**

**examen** (ig-zā′men), *n.* = **examination.**

**examinant** (ig-zam′ə-nənt), *n.* تاقیکەرەوە

**examination** (ig-zam′ə-nā′shən), *n.* (١) تاقیکردنەوە.

(٢) لێکۆڵینەوە؛ لێ ووردبوونەوە؛ پشکنین؛ تێڕوانین.

**examine** (ig-zam′in), *n.* (١) تاقیکردنەوە.

(٢) لێکۆڵینەوە؛ لێ ووردبوونەوە؛ تێڕوانین؛ پشکنین (نەخۆشی).

**examinee** (ig-zam′ə-nē′), *n.* تاقیکراوە (مرۆڤ)؛

کەسێکی تاقیکراوە

**example** (ig-zam′p'l, ig-zäm′p'l), *n.* (١) وێنە؛ نموونە:

*( to give an ~ ; an ~ of)*

(٢) نموونە؛ پێشڕەو *( to be an ~ to others)* .

(٣) نموونە؛ پەند: *( to make an ~ of him)* .

(٤) مەسەلە (بیرکاری).

**for example,** بۆ وێنە؛ بۆ نموونە.

**set an example,** بوون بە نموونە (لە ڕەفتار یا کردەوەدا).

**without example,** بێ وێنە؛ بێ هاوتا.

**exanimate** (ig-zan′ə-mit, ig-zan′ə-māt′), *adj.* (١) مردوو.

(٢) بێ ووزە؛ بێ هێز.

**exanthema** (ek′san-thē′mə), *n.* گەرمەژنە؛ قنچکە؛ زیپکە.

**exasperate** (ig-zas′pə-rāt′), *v.t.* (١) تووڕەکردن؛ ڕق هەڵساندن؛

پەستکردن؛ دیق پێکردن. (٢) توندوتیژتر یا خراپتر کردن (نەخۆشی، ئازار،

ناخۆشی، بار).

-**exasperater** *(n.).*

**exasperation** (ig-zas′pə-rā′shən), *n.* (١) تووڕەیی؛ پەستی؛

تووڕەکردن؛ دیق پێکردن. (٢) توندوتیژ یا خراپتر بوون (نەخۆشی، ئازار، بار،

ناخۆشی).

**excavate** (eks′kə-vāt′), *v.t.* (١) هەڵکەندنی زەوی.

(٢) لێدان (تونێل، خەنەق)؛ بڕین. *( to ~ a tunnel)* .

(٣) دەرهێنانی خاک یا کانزا بە هەڵکەندن؛ هەڵکەندن.

(٤) خستنەڕوو یا دەرخستن بە هەڵکەندن (شوێنەواری شارێکی کۆن).

**excavation** (eks′kə-vā′shən), *n.* (١) هەڵکەندنی زەوی.

(٢) چاڵێکی هەڵکەنراو. (٣) شتێکی لە بن زەوی دەرهێنراو بە هەڵکەندن

(شوێنەواری کۆن).

**excavator** (eks′kə-vā′tēr), *n.* هەڵکەن (مرۆڤ، مەکینە)؛ هەڵکەنەر.

**exceed** (ik-sēd′), *v.t.* (١) زیاتربوون یا ڕۆیشتن لە (سنوور، پەیڕەو)؛

تێپەڕبوون لە: *( He ~ed the speed limit.)* .

(٢) باشتربوون لە: *( The concert ~ed our expectations.)* .

*v.i.* باشتربوون لەوانی تر.

**exceeding** (ik-sēd′iŋ), *adj.* سەرئاسا؛ زیاتر لە؛ زۆر.

**exceedingly** (ik-sēd′iŋ-li), *adv.* ئێجگار؛ زۆر؛ یەکجار:

*( He is doing ~ well in his chemistry class.)*

**excel** (ik-sel′), *v.i. & v.t.* باشتربوون لە کەسانی تر؛ زۆر باش بوون لە:

*( He ~s in wit.; to ~ (others) in courage, strength, etc.;*

*to ~ as an actor; to ~ in sports.)*

**excellence** (ek′s'l-əns), *n.* (١) نایابی؛ زۆر باشی؛ زۆر باشێتی.

(٢) نیشانەیەکی نایاب؛ نیشانەی نایابی. (٣) [E-]، پایە بەرز.

**excellency** (ek′s'l-ən-si), *n.* (١) [E-] ، پایە بەرز؛ پایە بڵند:

*( His E~; Your ~ )*

(٢) [Archaic]، نایابی؛ زۆر باشی.

**excellent** (ek′s'l-ənt), *n.* نایاب؛ زۆر باش.

**except** (ik-sept′), *v.t.* بێجگەلێکردن؛ نەگرتنەوە (پەیڕەو، گومان، شت،

یا فەرمان)؛ لێ دەرکردن: *( When I say that most students are lazy,*

*of course I ~ you.)*

*v.i.* ( ~ against ), پەسەند نەکردن؛ دژ بوون یا وەستان:

*( I ~ against his statements.)*

*prep.* بێجگە لە؛ جگە لە:

*( everyone ~ me; I looked everywhere ~ in the bedroom.)*

*conj.* [Archaic], مەگەر.

**excepting** (ik-sep′tiŋ), *prep.* بێجگە لە؛ جگە لە؛ بەبێ.

*conj.* [Archaic], مەگەر.

**exception** (ik-sep′shən), *n.* (١) جیاوازی؛ جیاکاری؛ لێ دەرکردن؛

بێجگەکاری: *( You must all take the examination without ~ .)* .

(٢) جیا؛ نائاسا: *( He is an ~ ; an ~ to the rule)* .

(٣) پەسەند نەکردن: *( to take ~ to what a person says)* .

**take exception,** پەسەند نەکردن؛ بە دڵ نەبوون؛ پێ پەست بوون.

**exceptionable** (ik-sep′shən-ə-b'l), *adj.* (١) بۆی هەیە پەسەند

نەکرێت یا پەلپی لێ نگیرێت. (۲) بۆی هەیە جیا بکرێتەوە یا بێجگەکاری لەگەڵ بکرێت.

**exceptional** (ik-sep'shən-'l), *adj.* ئاناسا؛ سەرناسا؛ نایاب؛ بێ ئەندازە؛ زۆرباش *( an ~ student)*.

**exceptionally** (ik-sep'shən-'l-i), *adv.* لە ئەندازە بەدەر؛ نێجگار؛ زۆر *( an ~ good ( or bad) student)*.

**excerpt** (ik-sûrpt'), *v.t.* نموونە دەرهێنان یا هەڵبژاردن لە پەرتووکێك، ووتارێك، یا هەڵبەستێك

*n.* نموونەیەکی دەرهێنراو یا هەڵبژێراو لە پەرتووکێك، ووتارێك، یا هەڵبەستێك.

**excess** (ik-ses'), *n.* (۱) لە ئەندازە بەدەر (کردار، کردەوە، ڕەووشت)؛ زیاد لە ئەندازە

*( an ~ of kindness, enthusiasm, harshness, etc.)*

(۲) زۆر؛ زیاد لە پێویست (خواردن، خواردنەوە... هتد)؛

*( He eats, drinks, and smokes to ~ .)*

(۳) کردەوەی ناوانارانەو ناپەسەندانە

*( the ~es committed by the occupation army)*

(٤) لێ ماوە (ژمێرکاری)؛ ماوە؛ پاشماوە.

*adj.* زیادە *( ~ baggage; ~ profits)*.

in excess of, زیاتر لە؛ زیاد لە

to excess, لە ئەندازە بەدەر؛ لە ڕادە بەدەر

**excessive** (ik-ses'iv), *adj.* لە ئەندازە بەدەر؛ بێ ئەندازە؛ نێجگار زۆر؛ زیاتر لە پێویست *( ~ drinking; ~ prices)*.

**excessively** (ik-ses'iv-li), *adv.* بە بێ ئەندازەیی؛ بەشێوەیەکی لە ڕادە بەدەر یا بێ ئەندازە.

**exchange** (iks-chānj'), *v.t.* (۱) گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن؛

*( John ~s gifts with Mary at Christmas.)*

(۲) گۆڕینەوە *( She ~d honor for wealth.)*.

*v.i.* (۱) گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن (۲) وەکو یەك چوون (پارەی دوو وڵات).

*n.* (۱) گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکاری؛ ئاڵوگۆڕکردن.

(۲) دان و وەرگرتن؛ گۆڕینەوە *( an ~ of greetings)*.

(۳) شتێکی گۆڕاوە بە شتێکی تر.

(٤) شوێنی گۆڕینەوە یا ئاڵوگۆڕکاری *( a stock ~ )*.

(٥) فەرمانگەی تەلەفۆن

(٦) (ا) دانەوەی قەرز بە کۆمپیالە. (ب) کۆمپیالە.

(ج) مزی ئامادەکردنی کۆمپیالەو بڕوانامەی دارایی

(۷) (ا) پارە گۆڕینەوەی وڵاتێك بە هی وڵاتێکی تر

(ب) ڕێژەی ئەم گۆڕینەوەیە.

(ج) ئەو چەك و بڕوانامەی دارایییە کە ئاڵوگۆڕ دەکرێت لەنێوان بانقەکاندا.

(۸) پەیمانی ئاڵوگۆڕکاری.

*adj.* (۱) گۆڕاوە؛ جێ گۆڕکێ پێ کراو (لەنێوان دوو وڵاتدا)؛

*( an ~ student)*

(۲) تایبەتی بە پارەگۆڕەرەوە: *( an ~ broker)*.

**exchangeable** (iks-chān'jə-b'l), *adj.* ئاڵوگۆڕ دەکرێت؛ دەتوانرێت بگۆڕێتەوە

-exchangeability *(n.)*.

**exchange broker,** دەڵاڵی پارە گۆڕینەوە (هی وڵاتێك لەگەڵ وڵاتێکی تر)؛ پارەگۆڕەرەوە.

exchange blows, لەیەکدان؛ بەیەکدا کێشان.

exchange greetings, سڵاوکردن لەیەکتر

in exchange for, لە باتی؛ لە بریتی؛ لە جێی؛ لە جیاتی

rate of exchange, ڕێژەی پارە گۆڕینەوە.

**exchequer** (iks-chek'ēr, eks'chek-ēr), *n.* (۱) وەزارەتی دارایی (لە ئینگلتەرە) (۲) خەزێنەی وەزارەتی دارایی ئینگلیزی. (۳) خەزێنە (٤) سەرمایە؛ سامان؛ دەستمایە

**excise** (ik-sīz'), *n.* باج؛ باجێکە لەسەر تووتن و عەرەق و هەندێ شتی تر دادەنرێت: *( an ~ tax)*

*v.t.* باج لەسەر دانان.

**excise** (ik-sīz'), *v.t.* بڕین (بڕین، دوومەڵ، لوو)؛ قرتاندن؛ لابردن؛ دەرهێنان (لە لەش).

**exciseman** (ik-sīz'mən), *n.* باجگر (لە ئینگلتەرە)؛ باج کۆکەرەوە.

**excision** (ik-sizh'ən), *n.* بڕین (بڕین، دوومەڵ، لوو)؛ قرتاندن؛ لابردن؛ دەرهێنان (لە لەش).

**excitable** (ik-sī'tə-b'l), *adj.* زوو دێتە جۆش؛ زوو هەڵدەچێت؛ دەبزوێنرێت؛ بە ئاسانی دەووروژێنرێت.

-excitability *(n.)*.

**excitant** (ik-sī'tənt, ek'sə-tənt), *adj.* هێنەرە جۆش؛ بزوێنەر. (هەروەها " excitative; excitatory ").

**excitation** (ek'sī-tā'shən, ek'si-tā'shən), *n.* (۱) جۆش؛ هێنانە جۆش؛ هاتنە جۆش. (۲) (ا) دروووستکردنی ئەلەکتریك یا موگناتیس.

(ب) زیادکردنی ووزەی ئەتۆم یا گەردیلەیەك لە هی ئاسایی خۆی.

**excite** (ik-sīt'), *v.t.* (۱) خرۆشاندن؛ وورووژاندن؛ خستنە جموجووڵ.

(۲) بزواندن؛ جووڵاندن.

(۳) هەوەس هەڵساندن؛ خستنە جۆش؛ هێنانە جۆش.

(٤) (ا) بزوواندنی تەووژمی کارەبا.

(ب) تێدا پەیداکردنی ئەلەکتریك یا موگناتیس.

**excited** (ik-sīt'id), *adj.* هەست جووڵاو؛ وورووژاو؛ خرۆشاو؛ هەڵچوو؛ بەجۆش؛ دڵخۆش.

**excitement** (ik-sīt'mənt), *n.* (۱) خۆشی؛ شتێکی خۆش.

(۲) جۆش و خرۆش؛ جۆش؛ هەلەکەسەما؛ هاتنە جۆش.

**exciter** (ik-sīt'ēr), *n.* (۱) بزوێنەر؛ هێنەرە جۆش؛ وورووژێنەر.

(۲) پێکهێنەری ئەلەکتریك؛ دینەمۆ.

**exciting** (ik-sīt'iŋ), *adj.* خۆش؛ پڕ جۆش؛ بەجۆش؛ هێنەرە جۆش.

**exclaim** (iks-klām'), *v.i. & v.t.* هاوارکردن (بەجۆشەوە یا بەسەرسامییەوە).

**exclamation** (eks'klə-mā'shən), *n.* (۱) هاوار؛ هاوارکردن (لە پڕو بەجۆش، سەرسامی، ئازار، یا بەترسەوە).

(۲) شتێك کە بە هاوار دەربڕێت؛ نیشانەی سەرسامی.

**exclamation mark ( or point ),** نیشانەی سەرسامی (!) (ڕێزمان).

**exclamatory** (iks-klam'ə-tôr'i, iks-klam'ə-tō'ri), *adj.* تایبەتی بە هاوارکردن؛ سەرسامی: *( an ~ sentence)*.

**exclude** (iks-klōōd'), *v.t.* (۱) قەدەغەکردن؛ لێ قەدەغەکردن؛ ڕێگەی هاتنەژوورەوە پێ نەدان؛ نەگرتنە خۆ:

*( to ~ a person from membership in a society, organization, club, etc.)*

(۲) دەرکردن؛ دەرهاویشتن؛ پەڕکردن.

**exclusion** (iks-klōō'zhən), *n.* (۱) قەدەغەکردن؛ ڕێگە پێ نەدان؛ نەگرتنەخۆ. (۲) دەرکردن؛ دەرهاویشتن؛ پەڕکردن.

to the exclusion of, بۆ قەدەغەکردن؛ بۆ ڕێگەی هاتنەژوورەوە لێگرتن؛ بەبێ.

-exclusionist *(n.)*.

**exclusive** (iks-klōō'siv), *adj.* (۱) لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ تڕزل:

*( He is ~ in his manner.)*

(۲) هی تاقم یا چینێکی تایبەتی دەوڵەمەند؛ تایبەتی: *( an ~ club)*.

(۳) گران (فرۆشگا، گەڕەك)؛ گرانبەها:

*( an ~ shop; an ~ residential area)*

(٤) تەنها مافی کەسێك یا کۆمەڵێکە (فرۆشتنی شتێك لە ناوچەیەکدا)؛ تایبەتی؛ مافی کەسی تری پێوە نییە؛ تاقە:

*( an ~ right to sell something)*

*n.* ووتارێك یا دووانێك کە بۆ بڵاوکردنەوە بێت تەنها لەیەك ڕۆژنامە، ئێستگەی

رادیۆ یا تەلەفزیۆندا: ***(an ~ article; an ~ interview)***.

**-exclusiveness** *(n.)*; **exclusivity** *(n.)*.

**exclusive of,** بێجگە لە، جگە لە؛ بەبێ:

***(The ship had a crew of 50 ~ of officers.)***

**exclusively** (iks-kloo͞'siv-li), *adv.* تەنها؛ هەمووی؛ بەتەواوی

**excogitate** (eks-koj'ə-tāt'), *v.t.* بیرلێکردنەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ دانان (پلان)

**-excogitation** *(n.)*.

**excommunicate** (eks'kə-mū'nə-kāt'), *v.t.* لە کڵێسە دەرکردن؛ لە کڵێسە دابڕین یا پەیوەندی پچڕاندن.

*n.* کەسێکی لە کڵێسە دەرکراو یا دابڕاو.

**-excommunicable** *(adj.)*; **excommunicator** *(n.)*.

**excommunication** (eks'kə-mū'nə-kā'shən), *n.* (١) دابڕین یا دەرکردن لە کڵێسە. (٢) بڕیاری دەرکردن یا دابڕین لە کڵێسە.

**excoriate** (ik-skôr'i-āt', ik-skō'ri-āt'), *v.t.* (١) پاکردن؛ کوتان (برنج، ساوەر)؛ پێست لێکردنەوە. (٢) سەرزەنشت کردن؛ هێرش بردنە سەر.

**-excoriation** *(n.)*.

**excrement** (eks'krə-mənt), *n.* گوو؛ پیسایی

**excremental** (eks'krə-men't'l), *adj.* تایبەتی بە گوو یا پیسایی.

**excrescence** (iks-kres''ns), *n.* (١) شتێکی سرووشتی لە لەش دەرهاتوو (قژ، ریش، نینۆک). (٢) شتێکی ناشرینی ناسرووشتی لە لەش دەرهاتوو (وەک دوومەڵ)

**-excrescent** *(adj.)*.

**excreta** (eks-krē'tə), *n.* شتێک کە لەش دەری بدات یا لە لەش بێتە دەرەوە (نارەق، میز، گوو)؛ پیسایی.

**excrete** (iks-krēt'), *v.t. & v.i.* گووکردن؛ پیسایی کردن؛ میزکردن؛ نارەق کردن؛ دەردان (نارەق)

**excretion** (iks-krē'shən), *n.* (١) گووکردن؛ پیسایی کردن؛ میزکردن؛ نارەق دەردان. (٢) گوو میز؛ پیسایی؛ نارەق.

**excretory** (eks'kri-tôr'i, eks'kri-tō'ri), *adj.* (١) تایبەتی بە پیسایی؛ تایبەتی بە میزو گوو. (٢) هی ئەو ئەندامانەی لەش کە تایبەتین بە پیسایی کردن ***(~ organs)***.

**excruciate** (iks-kroo͞'shi-āt'), *v.t.* ئازاردان (لەش یا گیان و مێشک)؛ چەوساندنەوە.

**excruciating** (iks-kroo͞'shi-āt'iŋ), *adj.* بە ئازار؛ پڕ ئازار؛ ناخۆش؛ ئێحگار زۆر (ئێش و ئازار): ***(an ~ headache, pain, etc.)***.

**excruciation** (iks-kroo͞'shi-ā'shən, iks-kroo͞'si-ā'shən), *n.* (١) ئازاردان؛ چەوساندنەوە. (٢) ئازار؛ ئێش؛ ئێش و ئازار.

**exculpate** (eks'kəl-pāt', ik-skul'pāt), *v.t.* ئازادکردن (لە تاوان)؛ لە تاوان خۆشبوون

**-exculpation** *(n.)*; **exculpatory** *(adj.)*.

**excursion** (ik-skûr'zhən, ik-skûr'shən), *n.* (١) گەشت؛ گەڕان (٢) گەشتێکی دووسەری بە بلیتی نرخ داشکاو (بە فڕۆکە، شەمەندەفەر، ئوتومبیل، کەشتی). (٣) تاقمێک کە بچن بۆ گەشتێکی دووسەری وەها. (٤) لادان (لە ڕێگەی دیاریکراو)؛ لادان لە باس. (٥) [Obs.]، هێرشی سوپایی؛ بەسەرد‌ادان.

**excursionist** (ik-skûr'zhən-ist), *n.* گەشتیار؛ گەشتکەر.

**excursive** (ik-skûr'siv), *adj.* (١) تایبەتی بە گەشتی دووسەرەی هەرزان (٢) پچڕپچڕ (دووان، باس)؛ لە باس لادەر: ***(an ~ lecture)***. (٣) لامسەرلایی؛ ناڕێکوپێک: ***(~ reading habits)***.

**excusable** (ik-skūz'ə-b'l), *adj.* ای بی دەبوورێت؛ دەبوورێت؛ لێخۆشبوونی بۆ هەیە.

**excuse** (ik-skūz'), *v.t.* (١) لێخۆشبوون؛ ئازادکردن لە تاوان؛ بەخشین؛ لێبووردن. (٢) داوای لێبووردن کردن (٣) چاو لێ پۆشین؛ گوێ پێ نەدان (٤) لێبووردن (لە هێنانەدی پەیمانێکدا یا جێبەجێکردنی ئەرکێکدا). (٥) ڕێگەپێدان (بە ڕۆیشتن، یا بڵاوەلێکردن): ***(The teacher ~d the class.)*** (٦) بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ بوونە هۆی لێبووردن.

*n.* (١) داوای لێبووردن کردن (٢) لێبووردن؛ بەخشین. (٣) بەڵگە. (٤) بیانوو؛ بڕوبیانوو؛ بەهانە؛ پەڵپ.

**excuse oneself,** (١) داوای لێبووردن کردن (٢) داوای ڕێگەپێدان بۆ کردنی شتێک.

**excuse me.** بم بوورە؛ ببوورە (ووتەیەکە لەکاتی گفتوگۆ پێ بڕین، ڕا لەگەڵ نەبوون، داواکردنی شتێک، یا داوای بوار پێدان بۆ تێپەڕبوون بە شوێنێکی قەرەباڵغدا بەکاردەهێنرێت):

***(Excuse me, sir, will you tell me the way to the train-station?. Excuse me, but I don't think that statement is quite true.)***

**find an excuse,** بیانووگرتن؛ بیانوو هێنانەوە.

**exeat** (ig-zēt'), *n.* ڕێگەپێدان یا (مۆڵەت)ی سەردەمی (قوتابی زانکۆ، فەرمانبەر، قەشە... هتد).

**execrable** (ek'si-krə-b'l), *adj.* (١) زۆر ناپەسەند؛ زۆر بەد؛ بە لەعنەت. (٢) بێ فەڕ؛ گەنگ؛ قەڵپ.

**execrate** (ek'si-krāt'), *v.t.* (١) بە لەعنەت کردن. (٢) زۆر ڕق لێ بوون؛ زۆر قین لێ بوونەوە.

**execration** (ek'si-krā'shən), *n.* (١) لەعنەت لێکردن (٢) لەعنەت. (٣) ڕق؛ قین؛ زۆر ڕق لێ بوون. (٤) کەسێک یا شتێکی بە لەعنەت یا ڕق لێ بوو.

**executant** (ig-zek'yoo-tənt), *n.* بکەر؛ لێدەری پێکارێکی مۆسیقا.

**execute** (ek'si-kūt'), *v.t.* (١) جێبەجێکردن؛ بەجێهێنان؛ کردن؛ هەڵسووڕاندن: ***(to ~ an order, the law, etc.)***. (٢) کوشتن (بەپێی بڕیاری دادگا)؛ هەڵواسین؛ بە سێدارەدا کردن. (٣) هێنانەدی؛ کردن؛ درووستکردن: ***(He ~d a statue in marble.)*** (٤) نوواندن؛ خۆنوواندن (شانۆنامە، ئاهەنگی مۆسیقا). (٥) سازکردنی قۆنتەراتێک، پەیمانێک، یا وەسیەتنامەیەک بەپێی یاسا (کە ئامادەکردن و مۆرکردن و... هتد دەگرێتەوە).

**execution** (ek'si-kū'shən), *n.* (١) جێبەجێکردن؛ بەجێهێنان؛ کردن؛ هەڵسووڕاندن. (٢) کوشتن (بەپێی بڕیاری دادگا)؛ بە سێدارەدا کردن؛ هەڵواسین. (٣) (ا) چۆنێتی کردنی شتێک یا کارێک؛ شێوازی کردن. (ب) چۆنێتی نوواندنێک لە شانۆنامەیەک یا ئاهەنگێکی مۆسیقادا (٤) کردارێکی وێرانکەر یا کوشندە: ***(The bombs did heavy ~.)*** (٥) (ا) فەرمانی دادگا (بۆ بەجێهێنانی بڕیارێک). (ب) بەجێهێنانی ئەم جۆرە فەرمانە. (ج) مۆرکردنی بڕوانامەیەکی یاسایی.

**executioner** (ek'si-kū'shən-ēr), *n.* کوشتیار؛ سەربڕ؛ بە سێدارەداکەر.

**executive** (ig-zek'yoo-tiv), *adj.* (١) بۆ هەڵسووڕاندن یا جێبەجێکردن دەشێت؛ تایبەتی بە جێبەجێکردن: ***(~ ability)***. (٢) هی هەڵسووڕاندن یا جێبەجێکردن؛ فەرمانی: ***(the ~ branch of government)***

*n.* (١) لقی کارگێڕی میری؛ ئەو لق یا بەشەی میری کە کاروباری وڵات بەڕێوە دەبات؛ دەسەڵاتی هەڵسووڕاندن یا بەڕێوەبردن (فەرمانڕەوایی)؛ کاربەدەستێک لەم لقەی میریدا. (٢) کاربەدەستێکی گەورە (فەرمانڕەوایی، کۆمپانیا).

**executor** (ek'si-kū'tēr), *n.* (١) بکەر؛ بەجێهێنەر؛ جێبەجێکەر (٢) بەجێهێنەری وەسیەتنامەی مردوویەک؛ سەرووەسیەت.

**executory** (ig-zek'yoo-tôr'i, ig-zek'yoo-tō'ri), *adj.* (١)- هی هەڵسووڕاندن یا بەڕێوەبردن. (٢) لە کاردایە؛ کاری پێ دەکرێت

(٣) ئامادەیەو دانراوە بۆ بەجێهێنانی لەکاتی خۆیدا (قۆنتەرات، پەیمان).

**executrix** (ig-zek′yoo-triks), ***n.*** سەروەسیەت (ئافرەت)؛
بەجێهێنەری وەسیەتنامە (ژن).

**exegesis** (ek´sə-jē′sis), ***n.*** لێکدانەوەو ڕوونکردنەوە (ووشە یا ڕستە
بەتایبەتی هی ئینجیل)

**-exegetic** ***(adj.).***

**exegete** (ek′sə-jēt´), ***n.*** لێکدەرەوە یا ڕوونکەرەوە (بەتایبەتی ئینجیل).

**exemplar** (ig-zem′plēr, ig-zem′plär), ***n.*** نموونە (ڕەوشت،
کردەوە، کردار)

**exemplary** (ig-zem′plə-ri), ***adj.*** (١) نموونەیی
***( ~ behavior)***
(٢) وێنەیی، تایبەتی بە شتێکی وێنەیی: ***( ~ punishment)*** .

**exemplification** (ig-zem´plə-fi-kā′shən), ***n.*** (١) پیشاندان
بە نموونە؛ نموونەکاری؛ نواندن (٢) نموونە؛ وێنە.
(٣) بڕوانامەیەکی مۆرکراو (یاسا).

**exemplify** (ig-zem′plə-fī´), ***v.t.*** (١) (ا) نواندن؛ پیشاندان بە
نموونە (٢) بوون بە وێنە بۆ؛ نموونەکاری کردن؛ وێنە بوون بۆ.
(٢) دەرهێنانی وێنەی بڕوانامەیەکی مۆرکراو (یاسا).

**exempli gratia,** = **for example (e.g.),** بۆ وێنە؛ بۆ نموونە

**exemplum** (ig-zem′pləm), ***n.*** (١) نموونە، وێنە
(٢) چیرۆک، پەند

**exempt** (ig-zempt′), ***v.t.*** بەدەرکردن (لە پەیڕەوییەک یا ئەرکێک).
***adj.*** بەدەر؛ بەخشراو (لە پەیڕەو، ئەرک... هتد)
***n.*** کەسێکی بەدەر لە ئەرکێک.

**-exemptible** ***(n.).***

**exemption** (ig-zemp′shən), ***n.*** (١) بەدەرکردن (لە پەیڕەوی یا
ئەرک)؛ بەخشین (لە پێویستی سەرشان) (٢) بەدەربوون لە ڕەچاوکردن یا
پەیڕەوی کردن (٣) (ا) لێ دەرکردنی هەندێکی تایبەتی لە دەسکەوتی کەسێک
بەپێی سەر بۆ خۆی و خێزانەکەی وە باج لێ نەدانی لەسەر ئەو هەندە.
(ب) ئەو هەندە لێ دەرکراوە یا لێ داشکاوە. (ج) هەر سەرێکی خێزانێکی وەها.

**exequy** (ek′si-kwi), ***n. plural*** **exequies,** (١) (*pl*) پرسە
(٢) نەریت و دەستووری مردوو بردن بۆ گۆڕستان و ناشتنی.

**exercise** (ek′sēr-sīz´), ***n.*** (١) بەکارهێنان؛ نواندن (دەسەڵات):
***( the ~ of power)***
(٢) مەشق (لەش، مێشک)؛ وەرزش:
***( physical or mental ~ : Walking, running, rowing, and horse-riding are all healthy forms of ~ .)***
(٣) مەشق (خوێندن)؛ ڕاهێنان یا کۆشش:
***( ~s in mathematics, grammar, composition, etc.)***
(٤) مناوەرە؛ مەشق (سوپا).
(٥) مێشک بەکارهێنان یا مەشق پێکردن.
(٦) (*pl*) ئاهەنگی دەرچوون لە قوتابخانە: ***( graduation ~s)*** .

***v.t.*** (١) بەکارهێنان: ***( He ~d self-control.)*** .
(٢) وەرزش کردن؛ مەشق کردن؛ ڕاهێنان ***( He ~s daily.)***
(٣) مەشق پێکردن (سەرباز، ئەسپ):
***( She ~s her horse twice a week.)***
(٤) بەکارهێنان (ماف): ***( to ~ one's rights)***
(٥) بەکارهێنان (دەسەڵات).

***v.i.*** وەرزش کردن؛ مەشق کردن.

**exert** (ig-zûrt′), ***v.t.*** (١) بەکارهێنان (توانا، زیرەکی)؛ خستنەکار:
***( to ~ all one's strength | influence, will power | in order to do something)***
(٢) زۆرلێکردن؛ زۆر خستنەسەر: ***( to ~ pressure on)*** .
(٣) هەوڵدان؛ کۆشش کردن: ***( He didn't ~ himself much.)*** .

**exert oneself,** زۆر هەوڵدان؛ پاڵ بە خۆوە نان؛ کۆشش کردن؛
زۆر لە خۆ کردن؛ خۆماندوو کردن.

**exertion** (ig-zûr′shən), ***n.*** (١) هێز بەکارهێنان؛ زۆرکردن:
***( Sometimes persuasion is better than ~ of authority.)***
(٢) خستنەکار یا بەکارهێنانێکی زۆر (لەش، مێشک).
(٣) هەوڵدان؛ هەوڵ؛ تەقەلاکردن؛ ماندوو بوون.

**exeunt** (ek′si-ənt, ek′si-oont´), ***n.*** چوونەدەرەوە (دوو ئەکتەر یا
زیاتر لە شانۆ دوای تەواوبوونی بەشەکەیان).

**exfoliate** (eks-fō′li-āt´), ***v.t.*** توێکڵ یا پێست لێکردنەوە.
***v.i.*** توێکڵ یا پێست لێ بوونەوە.

**-exfoliation** ***(n.).***

**exhalant** (eks-hāl′ənt, ig-zāl′ənt), ***adj.*** (١) هەناسەدەرەوە.
(٢) تایبەتی بە هەناسەدانەوە.
***n.*** ئەندام یا بۆری هەناسەدانەوە.

**exhalation** (eg´zə-lā′shən), ***n.*** (١) هەناسەدانەوە؛
لێ هاتنە دەرەوە یا دانەوە (هەناسە، بۆن، دووکەڵ، هەڵم).
(٢) هەناسە؛ شتێکی دراوە (هەناسە، بۆن، دووکەڵ، هەڵم).

**exhale** (eks-hāl′, ig-zāl′), ***v.i.*** (١) هەناسەدانەوە.
(٢) بوونە هەڵم.
***v.t.*** (١) هەناسەدانەوە؛ کێشان (جگەرە).
(٢) دانەوە یا لێ هاتنە دەرەوە (بۆن، دووکەڵ، هەڵم).

**exhaust** (ig-zôst′), ***v.t.*** (١) لێ هێنانە دەرەوە (هەوا، گاز)؛ لێ دەرهێنان
(٢) هەموو بەکارهێنان و هیچ پێ نەمان: ***( He ~ed his resources.)***
(٣) بەتاڵ کردنەوە؛ هیچ تێدا نەهێشتن: ***( They ~ed the well.)*** .
(٤) لێ بڕان (سامان، ووزە)؛ هیچ بۆ نەهێشتنەوە: ***( War ~s nations.)*** .
(٥) ماندووکردن؛ هێز لێ بڕین؛ لە پەلوپۆ خستن؛ پڕووکاندن:
***( The trip ~ed him.)***
(٦) بە ووردی و بەتەواوی لێکۆڵینەوەی باسێک (هەتا هیچی نەمێنێتەوە کە
باس نەکرابێت): ***( She has ~ed the subject.)*** .
***v.i.*** لێوە هاتنەدەرەوە (گاز یا هەڵم لە مەکینەیەک).
***n.*** (١) لێوە هاتنەدەرەوەی هەوای پیس، دووکەڵ، یا هەڵم لە مەکینەیەکەوە
(٢) بۆری لێ هاتنەدەرەوەی هەوای پیس، دووکەڵ، یا هەڵم؛ ئەگزۆسی ئوتومبێل
(٣) هەواو بۆنی پیس، دووکەڵ، یا هەڵم کە لە مەکینەیەک دێتە دەرەوە.

**-exhaustible** ***(adj.).***

**exhausted** (ig-zôst′id), ***adj.*** (١) ماندوو؛ لە پەلوپۆ کەوتوو؛
پڕووکاو؛ هێز لێ بڕاو. (٢) هیچ پێ نەماو؛ نەماو؛ تەواو بوو:
***( My patience is ~ .)***

**exhaustion** (ig-zôs′chən), ***n.*** (١) ماندوویی؛ ماندوێتی؛
ماندووبوون؛ بێ ووزەیی؛ تین لێ بڕان. (٢) هیچ تێدا نەمان؛ بەفیڕۆچوون؛
بەتاڵ بوون؛ هیچ پێ نەهێشتن؛ هەموو بەکارهێنان.

**exhaustive** (ig-zôs′tiv), ***adj.*** (١) وورد؛ تەواو (لێکۆڵینەوە):
***( ~ research)***
(٢) هیچ پێ نەهێڵ؛ ماندووکەر.

**exhaustless** (ig-zôst′lis), ***adj.*** تەواو نابێت؛ دوایی نایەت؛
بێ پایان.

**exhibit** (ig-zib′it), ***v.t.*** (١) پیشاندان؛ نیشاندان؛ خستنەڕوو:
***( to ~ goods in shop windows or paintings in an art gallery)***
(٢) نواندن (نازایی، نارامی، تووڕەیی، بەزەیی... هتد):
***( to ~ patience, courage, kindness, impatience, etc.)***
(٣) پیشاندان یا پێشکەشکردنی بەڵگە لە دادگادا.
***n.*** (١) پیشاندان؛ خستنەڕوو. (٢) پیشانگا.
(٣) شتێکی پیشاندراو لە پیشانگادا.
(٤) بەڵگە یا قەواڵەی خراوەڕوو لە دادگادا

**-exhibiter** ***(n.)*****; exhibitor** ***(n.).***

**exhibition** (ek´sə-bish′ən), ***n.*** (١) پیشاندان؛ خستنەڕوو؛ نواندن.
(٢) شتی پیشاندراو.

(٣) پیشانگ (٤) [British]. بەخشیش یا یارمەتی‌یەکی دارایی کە زانکۆیەک دەیدات بە قوتابی‌یەک.

**exhibitioner** (ek´sə-bish′ən-ẽr), *n.* [British]. قوتابی‌یەکی زانکۆ کە یارمەتی دارایی وەردەگرێ.

**exhibitionism** (ek´sə-bish′ən-iz′m), *n.* (١) خۆدەرخستن؛ خۆنواندن؛ خۆپیشاندان. (٢) حەزکردن لە خۆڕووتکردنەوە لە بەرچاوی خەڵک؛ حەزکردن لە لەشی ڕووتی خۆ دەرخستن.

**exhibitionist** (ek´sə-bish′ən-ist), *n.* (١) خۆدەرخەر؛ خۆنوێنەر. (٢) کەسێک کە حەز لە خۆڕووتکردنەوە بکات لە بەرچاوی خەڵک.

**exhilarant** (ig-zil′ə-rənt), *adj.* (١) دڵخۆشکەر؛ کەیف پێدەر. (٢) وورریاکەرەوە؛ جۆشدەر.

*n.* (١) شتێکی دڵخۆشکەر. (٢) شتێکی جۆشدەر یا وورریاکەرەوە.

**exhilarate** (ig-zil′ə-rāt´), *v.t.* (١) دڵخۆش کردن؛ کەیف پێدان. (٢) خستنەجۆش؛ وورریاکردنەوە؛ بووژاندنەوە. *( A swim in the river will ~ you.)*

**-exhilarative** *(adj.)*; **exhilarating** *(adj.)*.

**exhilaration** (ig-zil´ə-rā′shən), *n.* (١) دڵخۆش کردن؛ خستنەجۆش؛ بووژاندنەوە. (٢) دڵخۆشی؛ خۆشی؛ کەیف خۆشی؛ بووژانەوە.

**exhort** (ig-zôrt′), *v.t. & v.i.* ئامۆژگاری کردن؛ هاندان (بۆ کردنی شتی باش)؛ پێ ووتن؛ تەمێ کردن.

**exhortation** (eg´zôr-tā′shən, ek´sẽr-tā′shən), *n.* (١) هاندان (بۆ کردەوەی چاک)؛ ئامۆژگاری کردن؛ پێ ووتن. (٢) ئامۆژگاری؛ تەمێ.

**exhume** (iks-hūm′, ig-zūm′), *v.t.* (١) لە گۆڕ دەرهێنان (لاشەی مردوو بۆ تاقیکردنەوە) *( to ~ a body)*. (٢) ئاشکراکردن؛ خستنەڕوو؛ دەرخستن؛ هەڵماڵین.

**-exhumation** *(n.)*.

**exigence** (ek′sə-jəns), *n.* exigency.

**exigency** (ek′sə-jən-si), *n.* (١) ناکاوی؛ بارێکی لە ناکاو. (٢) *(pl.)* پێویستی؛ شتی پێویست.

**exigent** (ek′sə-jənt), *adj.* (١) زۆر پێویست؛ پەلە؛ گرنگ. (٢) زۆر شت داواکەر؛ لە ئەندازە بەدەر شت پێویست.

**exile** (eg′zīl, ek′sīl), *n.* (١) دوورخرانەوە لە وولات بەزۆر؛ دەرکردن لە وولات؛ وولات بەجێهێشتن لە ناچاریدا؛ دەربەدەربوون؛ دەربەدەرکردن؛ ئاوارەیی؛ ئاوارەبوون؛ سەرگەردانی. (٢) کەسێکی دوورخراوە لە وولات؛ کەسێکی وولات بەجێهێشتوو لە ناچاریدا؛ کەسێکی لە وولات دەرکراو یا ئاوارە.

*v.t.* دوورخستنەوە لە وولاتی خۆ بەزۆر؛ دەرکردن لە وولاتی خۆ؛ ئاوارەکردن؛ دەربەدەرکردن؛ نەفی کردن.

**exist** (ig-zist′), *v.i.* (١) بوون؛ هەبوون. *( Do you believe that God ~s?)* (٢) بوون؛ تێدابوون. *( Water ~s in milk.)* (٣) ژیان؛ بەردەوام بوون لە ژیاندا. *( We can't ~ without air, food, and water.)*

**existence** (ig-zis′təns), *n.* (١) بوون؛ بوونەوەری. (٢) ژین؛ ژیان. *( Water is necessary for ~ .)* (٣) شێوەی ژیان. *[ to lead a happy (dangerous, wretched) ~ ]*. (٤) بوونەوەر؛ زیندەوەر؛ هەموو بوونەوەرێک.

**existent** (ig-zis′tənt), *adj.* (١) هەبوو؛ هەیە. (٢) ئامادە؛ ئێستا هەیە.

**existential** (eg´zis-ten′shəl, ek´sis-ten′shəl), *adj.* تایبەتی بە بوون؛ بوونەوەری.

**existentialism** (eg´zis-ten′shəl-iz′m), *n.* فەلسەفەی بوون یا بوونی؛ فەلسەفەی بوونەوەری.

**existentialist** (eg´zis-ten′shəl-ist), *n.* بوونخواز؛ پەیرەویکەری فەلسەفەی بوون.

**exit** (eg′zit, ek′sit), *n.* (١) لە شانۆ چوونەدەرەوەی ئەکتەر. (٢) چوونەدەرەوە؛ ڕۆیشتن؛ دەرچوون. (٣) دەرگا؛ دەروازە؛ جێگەی چوونەدەرەوە.

*v.i.* چوونەدەرەوە.

**exodus** (ek′sə-dəs), *n.* (١) کۆڕەو؛ گەلەڕەو؛ کۆچی بە کۆمەڵ؛ گەلەکۆچ. (٢) [the E-]: کۆچ کردنی جوولەکە لە میسرەوە (ئینجیل). (٣) [E-]: بەشی دووەمی ئینجیل کە باسی ئەم کۆچ کردنی جوولەکەیە دەکات.

**ex officio** (eks ə-fish′i-ō´), لەبەر پلەوپایەکەی؛ بەهۆی پلەوپایەکەیەوە: *( ~ members of a committee)*.

**exogamy** (eks-og′ə-mi), *n.* ژنهێنان (یا شووکردن) لە دەرەوەی خێڵی خۆ.

**-exogamic** *(adj.)*; **exogamous** *(adj.)*.

**exonerate** (ig-zon′ə-rāt´), *v.t.* (١) ڕزگارکردن؛ بار لە کۆڵ کردنەوە؛ لە کۆڵ کردنەوە. (٢) بێ تاوانی دەرخستنی کەسێک؛ ئازادکردن لە گومانباری؛ تاوان لەسەر لابردن: *[ to be ~d from blame (from an accusation or charge) ]*

**-exoneration** *(n.)*; **exonerator** *(n.)*.

**exophthalmia** (ek´sof-thal′mi-ə), *n.* چاو دەرپەڕین (پزیشکەوانی).

**exorable** (ek′sẽr-ə-b′l), *adj.* دڵنەرم.

**exorbitance** (ig-zôr′bə-təns), *n.* گرانبەهایی؛ نرخ گرانی؛ گرانی؛ لە ئەندازە بەدەری (نرخ).

**exorbitancy** (ig-zôr′bə-tən-si), *n.* exorbitance.

**exorbitant** (ig-zôr′bə-tənt), *adj.* گرانبەها؛ گران؛ زۆر گران؛ لە ئەندازە بەدەر (نرخ): *( ~ prices)*.

**-exorbitantly** *(adv.)*.

**exorcise, exorcize** (ek′sôr-sīz´), *v.t.* (١) جنۆکەو دێوودرنج لێ دوورخستنەوە بە جادووگەری. (٢) ئازادکردن لە جنۆکەو دێوودرنج. (٣) بانگ کردن یا فەرمان کردن بەسەر جنۆکەو دێوودرنجدا.

**exorcism** (ek′sôr-siz′m), *n.* (١) جنۆکەو دێوودرنج دوورخستنەوە بە جادووگەری. (٢) ئەو دۆعایانەی دەخوێنرێن بۆ دوورخستنەوەی جنۆکەو دێوودرنج لە کەسێک.

**exorcist** (ek′sôr-sist), *n.* جنۆکەو دێوودرنج دوورخەرەوە بە جادووگەری لە کەسێک کە گرتبێتیان.

**exordium** (ig-zôr′di-əm, ik-sôr′di-əm), *n.* (١) سەرەتا. (٢) سەرەتای ووتار یا نامیلکەیەک.

**exoteric** (ek´sə-ter′ik), *adj.* (١) دەرەوەیی؛ هی دەرەوە؛ دەرەکی. (٢) ئاشکرا؛ دیار؛ تێگەیشتنی ئاسانە.

**exotic** (ig-zot′ik), *adj.* (١) بێگانە؛ هی بێگانە؛ لە دەرەوە هێنراو. (٢) سەیر؛ دڵگیرو جوانو سەرنج ڕاکێشو دڵفڕێن: *[ ~ plants (foods, clothes, ideas, people, etc.) ]*

*n.* (١) شتێکی بێگانە یا لە دەرەوە هێنراو. (٢) ڕووەکێک کە هی ئەو شوێنە نەبێت تێیدا ڕواوە بەڵکو لە دەرەوە هێنرابێت.

**-exotically** *(adv.)*.

**expand** (ik-spand′), *v.t.* (١) کردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ ڕاکێشان: *( The eagle ~ed his wings.)* (٢) کشاندن؛ ڕاکێشان؛ گەورەکردن؛ درێژکردنەوە. (٣) فراوانکردن؛ پانکردن؛ گەورەکردن؛ پەرە پێ سەندن: *( to ~ a road, a street, or a business)* (٤) درێژەپێدان؛ پەرە پێ سەندن؛ زیاتر لەسەر دووان: *( to ~ a topic or an idea)* (٥) فراوانکردن: *( The purpose of education should be to ~ the minds of children.)*

*v.i.* (١) کشان؛ درێژبوونەوە: *( Metals ~ when they are heated.)* (٢) فراوان بوون؛ گەورەبوون؛ بڵاوبوونەوە؛ درێژبوونەوە؛ لقوپۆپ هاویشتن. (٣) (ا) کرانەوە (گوڵ، دەموچاو). (ب) دەم کێشان (برنج).

**expanded** (ik-span′did), *adj.* دریژە پێدراو؛
بە دوورودرێژی باس کراو؛ فراوان: ***(an ~ news program)***.
**expanse** (ik-spans′), *n.* فراوانی؛ مەودایەکی فراوان و کراوە و گەورە؛
شوێنێکی بەر بەرەلای فراوان: ***(the blue ~ of the sky)***
**expansion** (ik-span′shən), *n.* (۱) فراوانکردن؛ فراوان بوون؛
گەورەبوون؛ کشان؛ کشاندن (۲) بەشی فراوان کراو؛ شوێنێکی گەورەکراو.
(۳) رادەو ماوەی فراوانکردن (٤) داگیرکردنی زەوی‌وزار یا ولاتی خەڵك
لە رێگەی فراوانکردنی خۆوە (٥) لێکۆڵینەوەی باسێك بە دوورودرێژی.
**expansionism** (ik-span′shən-iz′m), *n.* فراوانکردنی ولات و
دەسەلاتی خۆ لە رێگەی داگیرکردنی ولاتانی ترەوە؛ داگیرکردنی ولاتی خەڵك؛
داگیرکاری.
**-expansionist** *(n.)*; **expansionistic** *(adj.)*.
**expansive** (ik-span′siv), *adj.* (۱) کشاو؛ بۆی هەیە بکشێت؛
دەکشێت (۲) فراوان؛ بلاو (۳) گشتی؛ گشتگر؛ گەورە.
(٤) رووکراوە و هاوسۆز؛ رووخۆش و کراوە؛ قسەلەروو: ***(an ~ person)***.
**-expansiveness** *(n.)*.
**expatiate** (ik-spā′shi-āt′), *v.i.* (۱) گەران بە سەربەخۆیی
(۲) ( ~ on; ~ upon ). بە دوورودرێژی نووسین یا دووان؛ درێژەپێدان.
**-expatiation** *(n.)*.
**expatriate** (eks-pā′tri-āt′), *v.t.* (۱) دەرکردن لە ولاتی خۆ؛
ئاوارەکردن؛ دوورخستنەوە لە ولاتی خۆ
(۲) ولاتی خۆ بەجێهێشتن لە ناچاریدا؛ ئاوارەبوون؛ کۆچ کردن.
*adj.* لە ولاتی خۆ دەرکراو؛ ولاتی خۆ بەجێهێشتوو؛ ئاوارە
*n.* کەسێکی دەرکراو لە ولاتی خۆ؛ کەسێك کە لە ناچاریدا ولاتی خۆی
بەجێهێشتبێ؛ ئاوارە؛ کۆچکەر
**-expatriation** *(n.)*.
**expect** (ik-spekt′), *v.t.* (۱) چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕێ بوون
(۲) بەتەمابوون؛ چاوەڕوان بوون: ***(I ~ed you yesterday.)***.
(۳) رابینین؛ لێ رابینین؛ چاوەڕوان لێکردن:
***(Some parents ~ too much from their children.)***
(٤) [Colloq.]. وا دانان؛ وا زانین.
**be expecting**, [Colloq.]. سکپربوون؛ سکپڕی؛ زۆر نەمان بۆ منداڵبوون
***(His wife is expecting.)***
**expectancy** (ik-spek′tən-si), *n.* (۱) بەتەمابوون؛ چاوەڕوان کردن؛
چاوەڕێ بوون؛ چاوەڕوانی؛ هیوا. (۲) (ا) شتێکی چاوەڕوانکراو یا بەتەمابوو.
(ب) هیوای مەودای ژیان؛ بەتەمابوونی ژیان:
***(a life ~ of seventy years)***
**expectant** (ik-spek′tənt), *adj.* (۱) بەتەما؛ چاوەڕوان؛ چاوەڕێ؛
چاوەڕێکەر (۲) چاوەڕوانی منداڵبوون؛ چاوەڕێکەری منداڵبوون:
***(an ~ mother)***
*n.* کەسێکی چاوەڕێ؛ کەسێکی بەتەما یا بە هیوا
**expectation** (ek′spek-tā′shən), *n.* (۱) بەتەمابوون؛ چاوەڕوانی؛
چاوەڕوان بوون (۲) لێ رابینین؛ پێ رابینین؛ چاوەڕوان لێکردن
(۳) شتێکی چاوەڕوانکراو؛ شتێکی بۆ بەتەمابوو
(٤) ئومێدەواری؛ هیوا (٥) لەوانەبوونی ڕوودانی شتێك
**expectation of life**, تێکرای تەمەن درێژی مرۆڤ لە ولاتێك و
چەرخێکی تایبەتیدا؛ ناوەندی مەودای ژیانی مرۆڤ.
**expectorate** (ik-spek′tə-rāt′), *v.i.* (۱) کۆکین و بەڵغەم فڕێدان
(۲) تف کردن؛ بەڵغەم فڕێدان.
**-expectoration** *(n.)*.
**expedience** (ik-spē′di-əns), *n.* = **expediency**.
**expediency** (ik-spē′di-ən-si), *n.* (۱) گونجان لەگەڵ بارێکی
تایبەتیدا؛ رێکەوتن؛ شیان بۆ مەبەستێکی تایبەتی
(۲) رەفتارکردن یا کارکردن بەپێی سوودی تایبەتی خۆ (بەبێ گوێدان بە
ڕەوایی و ناڕەوایی کردارەکە)؛ سوودی خۆیی؛ هەلپەرستی
***(We should not be guided by ~.)***
**expedient** (ik-spē′di-ənt), *adj.* (۱) گونجاو بۆ بارێکی تایبەتی؛
بۆ مەبەستێك یا سوودێکی تایبەتی شیاو؛ بەکەڵك؛ بەسوود:
***(Oftentimes governments do what is ~.)***
(۲) تایبەتی بە سوودی خۆو هەلپەرستی (بەبێ گوێدان بە ڕەوایی و
ناڕەوایی کارەکە)؛ هەلپەرست.
*n.* هۆی گەیشتن بە سوودی تایبەتی خۆ.
**expedite** (ek′spi-dīt′), *v.t.* (۱) ڕاپەڕاندن (کاروبار)؛ زوو ڕایی کردن
(کار، خواست)؛ زوو جێبەجێکردن؛ زوو تەواوکردن (کاروبار).
(۲) بەپەلە کردن؛ بە خێرایی کردن. (۳) [Rare]، ناردن.
**-expediter** *(n.)*.
**expedition** (ek′spi-dish′ən), *n.* (۱) گەشت (بۆ مەبەستێکی
تایبەتی): ***(a hunting ~; an ~ to the North Pole)***
(۲) ئەندامان و کەرەسەی گەشتێکی وەها: ***(a member of the ~)***
(۳) هێرشێکی سوپایی.
(٤) خێرایی؛ جێبەجێکردنی کاروبار زووبەزوو لەکاتی خۆیدا؛ پەلە.
**expeditionary** (ek′spi-dish′ən-er′i), *adj.* تایبەتی بە هێرشی
سوپایی و سوپاکەش خۆی: ***(An ~ force was sent to the region.)***
**expeditious** (ek′spi-dish′əs), *adj.* زووبەزوو (جێبەجێکردنی
کاروبار)؛ خێرا؛ گورج‌وگۆڵ.
**expeditiously** (ek′spi-dish′əs-li), *adv.* زووبەزوویی؛ خێرا؛
زوو (ڕاپەڕاندنی کار): ***(to do something ~)***.
**expel** (ik-spel′), *v.t.* (۱) دەرکردن (لە قوتابخانە، سوپا، حیزب،
ولاتێکی بێگانە؛ ڕێکخراو):
***(He was ~led from school for misconduct.)***
(۲) فڕێدان: ***(to ~ a shell from a gun)***
**expellant, expellent** (ik-spel′ənt), *adj.* دەرکەر؛ فڕێدەر.
*n.* دەرمانی ڕەوانی.
**expend** (ik-spend′), *v.t.* (۱) بەکارهێنان: ***(to ~ energy)***.
(۲) خەرج کردن؛ سەرف کردن.
**expendable** (ik-spen′də-b'l), *adj.* (۱) خەرج دەکرێت.
(۲) دەتوانرێت بکرێت بە قوربانی بۆ گەیشتنە مەبەستێك و بەئاسانی جێگەی
بگیرێتەوە (مرۆڤ، شت).
**expenditure** (ik-spen′di-chēr), *n.* (۱) خەرج کردن؛ بەکارهێنان
(پارە، کات). (۲) خەرجی؛ ئەوەندەی بەکاردەهێنرێت (پارە، کات).
**expense** (ik-spens′), *n.* (۱) خەرج کردن؛ سەرف کردن.
(۲) ( sing. & pl. )، تێچوون؛ مز.
(۳) (*pl.*) مەسرەف.
(٤) شتێك کە پارەی زۆری تێ بچێت:
***(A car can be a considerable ~.)***
(٥) شتی لەکیس چوو؛ قوربانی.
**at the expense of**, (۱) بە پارەی؛ لەسەر حسابی (پارە خەرج کردن).
(۲) لەسەر حسابی (زیان دان یا کردن بە قوربانی):
***(He became a doctor but only at the expense of his health.)***
**expensive** (ik-spen′siv), *adj.* گرانبەها؛ گران؛ گرانجان:
***(an ~ watch; ~ clothes; an ~ education; an ~ shop)***
**experience** (ik-spêr′i-əns), *n.* (۱) بەسەرهات؛ ڕووداوێك کە مرۆڤ
تێیدا بەشدار بووبێت: ***(a pleasant ~; a frightning ~)***.
(۲) هەموو بەسەرهاتی ڕابوردووی کەسێك:
***(It hasn't happened in my ~.)***
(۳) (ا) شارەزایی:
***(teaching ~; He doesn't have enough ~ for the job.)***
(ب) ماوەی ئەم شارەزایییە.
*v.t.* چەشتن؛ بەسەرهاتن؛ تووش بوون؛ هاتنەڕێ:
| *to ~ great hardships (pain, joy, difficulty, etc.)* |

**experienced** (ik-spêr′i-ənst), *adj.* شارەزا؛ قاڵ؛ سەردەرچوو؛
دنیادیدە.
**experiential** (ik-spêr′i-en′shəl), *adj.* تایبەتی بە بەسەرهاتی
خۆیی؛ هی بەسەرهاتێك كە مرۆڤەكە خۆی چەشتبێتی یا بەسەری هاتبێت.
**experiment** (ik-sper′ə-mənt), *n.* تاقیكردنەوە؛ ئەزموون.
*v.i.* تاقیكردنەوە
**experimental** (ik-sper′ə-men′t'l), *adj.* (١) هی تاقیكردنەوە؛
تەنها بۆ تاقیكردنەوەیە. (٢) نەچەسپیو؛ سەردەمی.
-experimentally *(adv.).*
**experimentalism** (ik-sper′ə-men′t'l-iz'm), *n.* پشت بەستن
بە تاقیكردنەوە؛ ڕێگەی تاقیكردنەوە گرتن.
**experimentation** (ik-sper′ə-men-tā′shən), *n.* تاقیكردنەوە؛
بەكارهێنانی تاقیكردنەوە.
**expert** (ek′spërt), *adj.* (١) شارەزا؛ وەستا؛ كارزان.
(٢) لە كەسێكی شارەزاوە؛ هی شارەزایەك؛ شارەزا: *(an ~ opinion)*.
*n.* (١) كەسێكی شارەزا، زانا، یا كارزان.
(٢) (ا) پلەی "دەست ڕاست" (تفەنگچێتی لە سوپادا).
(ب) سەربازێك كە بەم پلەیە گەیشتبێت
**expertise** (ek′spër-tēz′), *n.* شارەزایی؛ كارامەیی؛
زانایی (لە باسێك یا لە كارێكی تایبەتیدا)؛ كارزانی؛ لێزانین.
**expiate** (ek′spi-āt′), *v.t.* گوناهی خۆ سڕینەوە (لە ڕێگەی سزا
چەشتنەوە)؛ گوناە لەسەر خۆ لابردن (لە ڕێگەی بۆ بژاردن یا هەق كردنەوەوە).
-expiation *(n.)*; expiator *(n.)*.
**expiration** (ek′spə-rā′shən), *n.* (١) هەناسەدانەوە
(٢) (ا) سنێت كە لەگەڵ هەناسەدا بێتە دەرەوە
(ب) دەنگی لە دەمەوە دەرهاتوو
(٣) دوا هەناسە؛ مردن.
(٤) بەسەرچوون؛ بڕانەوە؛ كۆتایی هاتن؛ دوایی هاتن:
*(What is the passport's ~ date?)*
**expire** (ik-spīr′), *v.t.* (١) هەناسەدانەوە
(٢) [Obs.] لێ هاتن (بۆن).
*v.i.* (١) هەناسەدانەوە. (٢) دوا هەناسەدان؛ مردن؛ هەناسە دەرچوون.
(٣) بەسەرچوون (پەیمان)؛ دوایی هاتن؛ كۆتایی هاتن؛
*(The lease will ~ soon.;* تەواوبوون (ماوەی پەیمان)
*His term of office as President will ~ next year.)*
**expiry** (ik-spī′ri, ek′spə-ri), *n.* (١) بەسەرچوون؛ دوایی هاتن؛
كۆتایی هاتن. (٢) [Obs.] مردن.
**explain** (iks-plān′), *v.t.* (١) ڕوونكردنەوە؛ لێكدانەوە؛ ڕاڤەكردن
*(Will you ~ this problem to me? ; A dictionary ~s the meanings of words.)*
(٢) هۆ پیشاندان (بۆ كردەوەیەك، ڕەووشتێك یا هەڵەیەك)؛ لێكدانەوەی شتێكی
نائاسا (هەڵە، ڕەووشت، كردار): *(Can you ~ his behavior? ; How do you ~ all these accidents?)*
explain oneself, (١) مەبەستی خۆ ڕوونكردنەوە
(٢) پیشاندانی ڕەوایی ڕەووشتی خۆ؛ بەڵگە بۆ دۆزینەوەی ڕەفتاری
نائاسایی خۆ
explain something away, ڕوونكردنەوەی شتێك بە جۆرێك كە
ئەوەندە خراپ نەنوێنێت:
[*It will be difficult to explain such an error (act, etc.)*]
**explanation** (eks′plə-nā′shən), *n.* (١) ڕوونكردنەوە؛ ڕاڤەكردن.
(٢) ڕاڤە (٣) شتێكی ڕوونكەرەوە
(٤) لێكدانەوەو باسكردنی ناكۆكییەكەو دوایی پێ هێنانی بە ڕێكەوتن.
-explanatory *(adj.)*.
**expletive** (eks′pli-tiv), *n.* (١) جوێن؛ ووشەی ناشرین
(٢) ووشەیەك یا چەند ووشەیەك كە هەر بۆ ڕێكوپێكی ڕستەكە بەكاردەهێنرێت
نەك بۆ ماناكەی.
*adj.* تەنها بۆ پڕكردنەوە بەكاردەهێنرێت.
**explicable** (eks′pli-kə-b'l), *adj.* ڕوون دەكرێتەوە؛ لێكدەدرێتەوە
(كردەوە، ڕووداو، یا ڕەووشتێكی نائاسا).
**explicate** (eks′pli-kāt′), *v.t.* ڕوونكردنەوەی شتێكی ناڕوون؛
لێكدانەوە.
-explicative *(adj.)*; explicatory *(adj.)*.
**explication** (eks′pli-kā′shən), *n.* (١) ڕوونكردنەوە؛ لێكدانەوە.
(٢) لێكدانەوەیەكی دوورودرێژ
**explicit** (iks-plis′it), *adj.* (١) ڕوون؛ دیار؛ ئاشكرا:
*(an ~ statement)*
(٢) لەڕوو (ووتە)؛ هیچ نەشارەوە؛ بێ پێچوپەنا:
*(to be ~ about a matter)*
**explicitly** (iks-plis′it-li), *adv.* (١) بەڕوونی؛ بەبێ پێچوپەنا.
(٢) بەئاشكرا؛ بەبێ هیچ شاردنەوە.
**explode** (iks-plōd′), *v.t.* (١) ڕووهەڵماڵین؛ جاڕلێدان؛
دەرخستن (ناتەواوییەك). (٢) تەقاندن؛ تەقاندنەوە؛ شەقە لێ هەڵسان
*v.i.* (١) تەقین؛ تەقینەوە؛ كڵپەكردن؛ شەق بردن.
(٢) شەق بردن لە توورەییدا؛ زۆر توورەبوونو هاواركردن:
*(He ~d with anger.)*
**exploit** (eks′ploit, iks-ploit′), *n.* كردەوەیەكی لێهاتووانە؛
كارێكی ئازایانەو دانایانە.
*v.t.* (١) بەكارهێنان؛ وەسوودهێنان؛ وەبەرهێنان.
(٢) بەكارهێنان بۆ سوود، مەبەست، یا ئامانجی خۆ:
*(to ~ one's friends or a situation)*
(٣) برەوپێدان: *(to ~ a product)*
(٤) چەوساندنەوە؛ ڕووتاندنەوە: *(to ~ the peasants)*.
-exploitative *(adv.)*; exploiter *(n.)*.
**exploitation** (eks′ploi-tā′shən), *n.* (١) وەبەرهێنان؛
وەسوودهێنان؛ بەكارهێنانو كەڵك لێ وەرگرتن: *(the ~ of a mine)*
(٢) چەوساندنەوە؛ ڕووتاندنەوە؛ بەكارهێنان بۆ سوودی خۆ:
*(the ~ of the workers in factories)*
**exploration** (eks′plō-rā′shən), *n.* (١) لێ ووردبوونەوە؛ تێڕوانین؛
بەووردی لێكۆڵینەوە. (٢) بۆ گەڕانو دۆزینەوە(جێگەی تازە)؛ كنە؛ كنەكردن؛
پیاگەڕان. (٣) تێڕوانینی ئەندامێكی لەش یا برینێك (پزیشكەوانی).
**exploratory** (iks-plôr′ə-tôr′i), *adj.* تایبەت بە بۆ گەڕان یا
كنەكردنێكی سەرەتایی: *(an ~ meeting)*.
**explore** (iks-plôr′, iks-plōr′), *v.t.* (١) لێكۆڵینەوە بەووردی؛
لێ ووردبوونەوە:
*(to ~ a question, a problem, a possibility, an idea)*
(٢) بۆ گەڕان؛ پێدا گەڕان؛ دۆزینەوە؛ كنە تێدا كردن:
*(Columbus discovered America, but did not ~ the new continent.)*
(٣) لێ ووردبوونەوەی ئەندامێكی لەش یا برینێك (پزیشكەوانی).
-explorative *(adj.)*.
**explorer** (iks-plôr′ër, iks-plō′rër), *n.* (١) گەڕاڵ؛ كەسێك كە
بە دوای شوێنی تازەدا بگەڕێت؛ دۆزەرەوە؛ كنەكەر.
(٢) ئامێرێكی پزیشكییە بۆ لێ ووردبوونەوەی ئەندامێكی لەش یا برینێك
**explosion** (iks-plō′zhən), *n.* (١) تەقین؛ تەقینەوە.
(٢) تەقە؛ شەقە؛ دەنگی تەقینەوە.
(٣) دەنگی توورەیی یا پێكەنین: *(an ~ of anger, laughter, etc.)*
(٤) دەنگی پڕتاندنی هەندێ تیپی وەك " پ " لەم ووشەیە خۆیدا.
**explosive** (iks-plō′siv), *adj.* (١) دەنگدەرەوە؛ دەنگدار؛ شەقەدار؛
تەقەدار. (٢) لە تەقینەوەدایە (مەسەلە، بار)؛ پڕ لە مەترسی:
*(an ~ situation)*

(٣) ئەنگدار (وەك تیپی: ب، د، گ، ك، پ، ت )، لە سەرەتای ووشەدا.

*n.* (١) ئەقەمەنی؛ ئەقندە. (٢) تیپێکی دەنگدار (ژمارە سێ ببینە).

**exponent** (ik-spō′nənt), *n.* (١) بێکدەرەوە (بیروباوەڕ، مەسەلە)؛ ڕوونکەرەوە. (٢) نموونە (مرۆڤ، شت)؛ نوێنەر. (٣) جا (بیرکاری)؛ توان.

**exponential** (ek′spō-nen′shəl), *adj.* تایبەتی بە جا یا توان (بیرکاری).

**export** (ik-spôrt′, ik-spōrt′), *v.t.* ناردن بۆ دەرەوەی وولات (شتومەك، بیروباوەڕ، شۆڕش).

*n.* (١) ناردە؛ شتی نێراو بۆ دەرەوەی وولات. (٢) ناردنی شتومەك بۆ دەرەوەی وولات.

*adj.* تایبەتی بە ناردن بۆ دەرەوەی وولات (شتومەك).

**exportation** (ek′spôr-tā′shən), *n.* (١) ناردن بۆ دەرەوەی وولات (شتومەك). (٢) ناردە؛ شتی نێراو بۆ دەرەوەی وولات.

**exporter** (ik-spôr′tēr, ik-spōr′tēr), *n.* شت نێرەر بۆ دەرەوەی وولات (مرۆڤ، کۆمپانی).

**expose** (ik-spōz′), *v.t.* (١) خستنەبەر مەترسییەوە؛ بەرەڵاکردن؛ نەپاراستن. (٢) بەجێهێشتن؛ نەویستن و واز لێ نەهێنان. (٣) خستنەڕوو؛ خستنە بەرچاو؛ دەرخستن. (٤) ڕووهەڵماڵین (درۆ، تاوان)؛ جاڕلێدان؛ خستنەبەرچاو (بەدی، کاری خراپ)؛ ئاشکراکردن. (٥) دانەبەر ڕووناکی (فیلمی کامێرا یا هی تر).

**exposé** (ek′spō-zā′), *n.* (١) نواندن؛ پیشاندان؛ ڕوونکردنەوە. (٢) ڕووهەڵماڵین (تاوان، ئابڕوچوون؛ گومانباری)؛ جاڕلێدان؛ ئاشکراکردن.

**exposed** (ik-spōzd′), *adj.* (١) سەر بەرەڵا؛ بەدەرەوە؛ ئاشکرا. (٢) مەترسی لێ دەکرێت.

**exposition** (ek′spə-zish′ən), *n.* (١) ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕێك بە دوورودرێژی. (٢) نووسینێك یا دووانێکی ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە. (٣) پیشانگا (بەتایبەتی هی جیهانی). (٤) سەرەتای شانۆنامەیەك. (٥) بەشی یەکەمی پارچە مۆسیقایەك. (٦) [Obs.]: ئاشکراکردن؛ ئاشکرابوون؛ ڕوو هەڵماڵین.

-expositive *(adj.)*.

**expositor** (ik-spoz′ə-tēr), *n.* مرۆڤێك یا نووسراوێکی ڕوونکەرەوە.

**expository** (ik-spoz′ə-tôr′i, ik-spoz′ə-tō′ri), *adj.* نووسین یا دووانی ڕوونکەرەوە؛ ڕوونکەرەوە؛ لێکدەرەوە: *( ~ writing)*.

**ex post facto** (ek spōst fak′tō), دوای ڕووداوێك دەکرێت یا دەهێنرێتە کایەوە، بەڵام کار لە ڕووداو و شتی پێشووتریش دەکات (یاسا): *( an ~ law)*

**expostulate** (ik-spos′chə-lāt′), *v.i.* مشتومڕکردن؛ بەرپەرچدانەوە؛ کەم وکووڕی خستنەبەرچاو؛ ناڕەزایی دەربڕین.

-expostulator *(n.)*; expostulatory *(adj.)*.

**expostulation** (ik-spos′chə-lā′shən), *n.* مشتومڕ؛ ناڕەزایی؛ ناڕەزایی دەربڕین؛ بەرپەرچدانەوە

**exposure** (ik-spō′zhēr), *n.* (١) دەرکەوتن؛ کەوتنەڕوو؛ داپۆشین: *( The ~ of the body to sunlight is healthy.; The mountain climbers died of ~ )* (٢) هەڵماڵین؛ ڕووهەڵماڵین (تاوان، درۆ، گومانباری، تاوانبار)؛ ئاشکراکردن؛ خستنەڕوو *( the ~ of a crime, a plot, a criminal act, etc.)*. (٣) ئاشکرابوونێك؛ ڕووهەڵماڵرانێك. (٤) دانە بەرڕووناکی (فیلم). (ب) وێنە (فیلمی کامێرا): *( a film with twenty-four ~s)*. (٥) ئەو لایەی خانوویەك ڕووی تێ دەکات؛ ئەو لا یا ڕووەی کە هەتاو و باو باران لێوەی دێت بۆ خانوویەك *( a house with a southern ~ )*

**expound** (ik-spound′), *v.t.* باسکردن بە دوورودرێژی؛ ڕوونکردنەوە؛ لێکدانەوە *( to ~ a theory, one's views, etc.)*.

**express** (iks-pres′), *v.t.* (١) بەزۆر لێ دەرهێنان یا لێ سەندن. (ب) گوشین و شیراو لێ دەرهێنان. (٢) دەربڕین (ووتە، بیروڕا)؛ ووتن؛ درکاندن. (٣) پیشاندان؛ دەرخستن: *( His face ~ed sorrow.)*. (٤) دەربڕین (لە ڕێگەی هونەر و وێژە و مۆسیقاوە). (٥) نواندن؛ نیشانەبوون: *( The sign + ~es addition.)*. (٦) ناردن بە پۆستەی خێرا.

*adj.* (١) دەربڕاو؛ بەڕوونی ووتراو؛ ڕوون. (٢) تەواو؛ دەقاودەق: *( the ~ image of a person)*. (٣) مەبەستی تایبەتی یا ڕوون: *( He came with the ~ purpose of eating.)* (٤) یەکسەر؛ بەبێ وەستان؛ خێرا: *( an ~ train or bus)*. (٥) (ا) خێرا؛ بۆ خێرا لێخوڕین: *( an ~ highway)*. (ب) تیژ؛ خێرا: *( an ~ bullet)*.

*adv.* بە هی یەکسەر یا خێرا (شەمەندەفەر، پاس، پۆستە، ڕێگەوبان).

*n.* (١) پەیامبەر. (٢) پەیام (بەتایبەتی هی پەلە کە بە پەیامبەری تایبەتیدا بنێردرێت). (٣) (ا) شەمەندەفەر یا پاسی یەکسەر یا خێرا. (ب) تفەنگێك کە گوللەی تیژی پێ دەتەقێنرێت. (٤) ناردنی شتومەك یا پارە بە هۆیەکی خێرادا. (٥) ئەو پارە یا شتومەکەی بەهۆیەکی خێرادا دەنێردرێت. (٦) هۆیەکی گواستنەوەی خێرا. (٧) دەزگایەکی گواستنەوەی خێرا.

**express oneself,** (١) بیروڕای خۆ دەربڕین. (٢) هەست و بیروڕای خۆ دەربڕین لەڕێگەی نووسین و هونەرەوە.

**expression** (iks-presh′ən), *n.* (١) گوشین و شیراو دەرهێنان. (٢) دەربڕین (ووتە، بیروباوەڕ)؛ ووتن؛ درکاندن. (٣) دەربڕین لەڕێگەی هونەر و وێژە و مۆسیقاوە. (٤) دەربڕینێك یا نواندنێکی پڕ مانا و کارتێکەر: *( She reads with ~ .)*. (٥) ووتەیەك یا زاراوەیەك کە بە مانایەکی تایبەتی بەکاربهێنرێت؛ ووتە؛ زاراوە: *( "Catch cold" is an idiomatic ~ .)*. (٦) ڕووخسارێك، سەیرکردنێك، یا جۆری دووانێك کە هەستێك دەربڕێت. (٧) نیشانەی جەبری یا بیرکاری. (٨) نیشانە. (٩) نواندن (لەڕێگەی نیشانەوە).

**expressionism** (iks-presh′ən-iz′m), *n.* دەروون دەربڕین لە هونەردا؛ شێوازێکی هونەری (بەتایبەتی شانۆگەری و نیگارکێشی) سەرەتای سەدەی بیستەمە بریتییە لە دەربڕین و نواندنی هەست و نەستی هونەرمەندەکە خۆی و زۆر گوێ نەدان بە ڕاستی دیار و بێ لایەن بەچاو بینراو

-expressionist *(n.)*; expressiontisic *(adj.)*; expressionistically *(adv.)*.

**expressionless** (iks-presh′ən-lis), *adj.* هیچ نابینرێت لە ڕووخساریدا؛ بە ڕواڵەت هیچ دەرناخات؛ هەست دەرنەبڕ.

**expressive** (iks-pres′iv), *adj.* (١) پڕ مانا؛ هەست دەربڕ: *( an ~ voice, look, gesture, smile, etc.)* (٢) دەربڕ: *( a song ~ of joy)*.

**expressly** (iks-pres′li), *adv.* (١) بە ڕوونی؛ بە ئاشکرا. (٢) بەتایبەتی؛ بە دەسەنقەست.

**expressman** (iks-pres′mən), *n.* فەرمانبەری کۆمپانیای گواستنەوە (بەتایبەتی شوفێرێك کە پریاسکە کۆدەکاتەوە و بەشی دەکات).

**express train,** شەمەندەفەری خێرا (کە کەم لە ئێستگە دەوەستێت)؛ شەمەندەفەری یەکسەر یا ئێکسپرێس.

**expressway** (iks-pres′wā′), *n.* ڕێگەیەکی گەورەی هاتوچۆی خێرا بە ئوتومبێل.

**expropriate** (eks-prō′pri-āt′), *v.t.* (١) دەست بەسەرداگرتنی زەوی وزار و خانوو بۆ بەکارهێنانیان. (٢) لێ سەندن بەزۆر (زەوی وزار، خانوو، سەرمایە)؛ لێ زەوتکردن. (٣) گۆڕینی خاوەنێتی زەوی وزار لە کەسێك یا وولاتێکەوە بۆ یەکێکی تر.

-expropriator *(n.)*.

**expropriation** (eks´prō-pri-ā′shən), *n.* (١) دەست بەسەردا- گرتنی زەوی‌وزارو خانوو بۆ بەکارهێنان‌و سوودی گشتی: *( the ~ of property)*
(٢) بەزۆر لێ سەندنی زەوی‌وزارو خانوو سەرمایە.

**expulsion** (ik-spul′shən), *n.* (١) دەرکردن. *( the ~ of a boy from school)*
(٢) دەرکران؛ بەزۆر لابران؛ دەرکردن.

**expunge** (ik-spunj′), *v.t.* سڕینەوە؛ کوژاندنەوە؛ لابردن: *( to ~ a name from a list)*

**expurgate** (ek′spēr-gāt´), *v.t.* لابردنی بەشە نابەجێ‌و ناشرینەکانی پەرتووکێك

-expurgation *(n.)*; expurgator *(n.)*; expurgatory *(adj.)*.

**exquisite** (eks′kwi-zit, ik-skwiz′it), *adj.* (١) ووردو جوان‌و نایاب. *( ~ designs)*.
(٢) بەرز؛ ناسك؛ جوان: *( She has an ~ taste.)*.
(٣) زۆر جوان‌و نایاب: *( ~ lace)*.
(٤) بەهەست؛ هەست وورد: *( an ~ ear for music)*.
(٥) تیژ (ئازار، خۆشی): *( ~ pain, joy, etc.)*
*n.* کەسێکی ناسك‌و ڕێك‌وپێك‌و هەست بەرز.

**extant** (ek′stənt, ik-stant′), *adj.* (١) ماو؛ نەفەوتاو (بەڵگەنامە، دەستنووس، پەرتووك، کەلەپووری نووسراوە): *( ~ manuscripts)*.
(٢) [Archaic]. زۆر لەبەرچاو؛ زۆر دیار

**extemporal** (ik-stem′pēr-əl), *adj.* [Archaic], extemporaneous.

**extemporaneous** (ik-stem´pə-rā′ni-əs), *adj.* (١) لەبەربوورە؛ لەخۆوەو بێ ئامادەکردن؛ ئامادەنەکراو: *( an ~ speech)*
(٢) ئامادەکراو بەڵام نەنووسراو (ووتار).
(٣) لێهاتوو لە دووانی ئامادەنەکراودا.
(٤) سەردەمی؛ سەرپێیی: *( an ~ fireplace)*

-extemporarily *(adv.)*; extemporariness *(n.)*.

**extemporary** (ik-stem′pə-rer´i), *adj.* = extemporaneous.

**extempore** (ik-stem′pə-ri), *adv. & adj.* لەبەربوورە؛ سەرپێیی؛ بەبێ ئامادەکردن: *( a speech given ~ )*.

**extemporize** (ik-stem′pə-riz´), *v.i. & v.t.* ووتار خوێندنەوە، دووان، نووسین، یا نواندن لەبەربوورە یا بەبێ خۆ ئامادەکردن.

-extemporization *(n.)*.

**extend** (ik-stend′), *v.t.* (١) درێژکردنەوە؛ درێژەپێدان؛ بەردەوام کردن (٢) فراوانکردن (مەودا، مانا، دەسەڵات)؛ بڵاوکردنەوە.
(٣) پێدان؛ پێشکەشکردن: *( to ~ greetings; to ~ an invitation to someone)*
(٤) ڕاکێشان (دەست، لاق، باڵ)؛ ڕاکشان؛ کشاندن
(٥) خۆ ماندووکردن؛ پاڵ بە خۆوە نان زیاد لە پێویست: *( to ~ oneself too much)*
(٦) ماوەپێدان (قەرزدانەوە)؛ مۆڵەت پێدان؛ بۆ درێژکردنەوە: *( to ~ a scholarship)*
(٧) وەهالێکردن کە بەشی زۆرتر یا زیاتر بکات (خواردەمەنی‌یەکی نایاب بە تێکەڵاوکردنی لەگەڵ خواردەمەنی‌یەکی هەرزانتردا).
(٨) (ا) هەڵسەنگاندن؛ نرخ بۆ دانان
(ب) دەست بەسەرداگرتن یا باج لەسەر دانان.
*v.i.* (١) درێژبوونەوە؛ بڵاوبوونەوە؛ گەیشتنە شوێنێك (دەسەڵات، سنوور)؛ گرتنەوە *( His property line ~s to the stream.)*.
(٢) سەردەرکێشان؛ سەردەرهێنان؛ دەرپەڕین.

**extended** (ik-sten′did), *adj.* (١) فراوان؛ گەورە؛ بڵاو *( an ~ empire)*
(٢) درێژەپێدراو؛ درێژ؛ ڕاکێشراو.
(٣) دوورودرێژ؛ درێژخایەن: *( an ~ vacation, visit, etc.)*

**extendible** (ik-sten′də-b'l), *adj.* = extensible.

**extensible** (ik-sten′sə-b'l), *adj.* درێژ دەکرێتەوە؛ درێژەی پێ دەدرێت.

**extension** (ik-sten′shən), *n.* (١) درێژکردنەوە؛ درێژبوونەوە.
(٢) مەودا؛ ڕادەی درێژکردنەوە یا درێژبوونەوە.
(٣) پاشکۆ؛ پاشبەند؛ زیادە: *( an ~ to a factory, a house, etc.)*
(٤) لقی زانکۆیەك لە شوێنێك یا کاتێکی جیاوازدا بۆ ئەوانەی ناتوانن بچنە زانکۆ سەرەکی‌یەکە: *( university ~ )*.
(٥) لق؛ پاشکۆ؛ پاشبەند؛ پەل.
(٦) تەلەفۆنێکی زیادە کە بە هێڵە سەرەکی‌یەکەوە بەستراوە.
(٧) ڕاکێشانی پەلی زیندەوەر؛ ڕاستکردنەوەی پەلێکی چەوت.
(٨) ماوەی زیادە (قەرزدانەوە)؛ مۆڵەت پێدان؛ ماوە بۆ درێژکردنەوە.
(٩) گرتنەوە (مانای ووشەیەك).

**extensive** (ik-sten′siv), *adj.* (١) فراوان؛ گەورە (شوێن)؛ بڵاو.
(٢) زۆر؛ نێجگار زۆر؛ گشتگر *( ~ injuries, notes, work, etc.)*
(٣) بەکارهێنانی زەوی‌وزارێکی زۆر بۆ کشتوکاڵێکی تەنك یا کەم‌و هەرزان کەوتوو لەسەر کشتیارەکە: *( ~ farming)*.

-extensively *(adv.)*; extensiveness *(n.)*.

**extent** (ik-stent′), *n.* (١) درێژایی؛ پانی؛ گەورەیی؛ هەند.
(٢) مەودا.
(٣) جێگەیەکی زۆر گەورەو فراوان: *( an ~ of woodland)*.
(٤) ڕادە؛ پلە: *( I agree with you to a certain ~ .; To what ~ ?)*
(٥) هەڵسەنگاندن (زەوی‌وزار)؛ نرخ بۆ دانان.
(٦) (ا) فەرماننامەی دادگا بە دەست بەسەرداگرتنی زەوی‌وزاری قەرزارێك
(ب) دەست بەسەرداگرتنی ئەم زەوی‌وزارە.
to a great extent, تا ڕادەیەکی زۆر.
to some extent, تا ڕادەیەك.
to what extent?, تا چی ڕادەیەك؟

**extenuate** (ik-sten′ū-āt´), *v.t.* (١) تەنك کردن.
(٢) کەمکردنەوە؛ لاوازکردن. (٣) بە کەمتر دانان؛ بەبێ بایەختر دانان.
(٤) لە خراپی‌و توندوتیژی تاوانێك کەمکردنەوە یا سووك کردنی (بە بەڵگە بۆ هێنانەوەی): *( to ~ a crime; Nothing can ~ his wrongdoing.)*

**extenuating circumstances,** ئەو بەڵگەو هۆیانەی کە لە توندوتیژی‌و خراپەی تاوانێك‌و سزاکەی کەم دەکەنەوە.

**extenuation** (ik-sten´ū-ā′shən), *n.* (١) کەمکردنەوە یا کەم بوونەوەی توندوتیژی‌و خراپی تاوانێك بە بەڵگە بۆ هێنانەوەی
(٢) بەڵگەیەك کە لە توندوتیژی‌و خراپی تاوانێك کەم دەکاتەوە.

-extenuative *(adj.)*; extenuatory *(adj.)*.

**exterior** (ik-stêr′i-ēr), *adj.* (١) دەرەوە؛ هی دەرەوە؛ دەرینە: *( an ~ wall)*
(٢) دەرەکی؛ دەرەوە: *( ~ forces)*.
(٣) بێگانە؛ هی کاروباری بێگانە یا دەرەوە.
*n.* (١) دەرەوە؛ دەرێ.
(٢) ڕووالەت؛ ڕوو: *( a misleading ~ ; a beautiful ~ )*

**exterior angle,** گۆشەی دەرەوە؛ گۆشەی دەرەکی.

**exterminate** (ik-stūr′mə-nāt´), *v.t.* لەناوبردن؛ نەهێشتن؛ کوشتن؛ بەرپاکردن؛ قەلاچۆکردن؛ ڕیشە دەرهێنان؛ دوایی پێ هێنان؛ فەوتاندن؛ بنەبڕکردن؛ ڕیشە بڕین؛ لە ڕەگ دەرکێشان.

-exterminative *(adj.)*; exterminatory *(adj.)*.

**extermination** (ik-stūr´mə-nā′shən), *n.* لەناوبردن؛ فەوتاندن؛ نەمان؛ نەهێشتن؛ کوشتن؛ بەرپاکردن؛ بەرپابوون؛ قەلاچۆکردن؛ بنەبڕکردن؛

ڕیشە دەرهێنان؛ لە ڕەگ دەرهێنان

**exterminator** (ik-stûr′mə-nā′tẽr), *n.* لەناوبەر (مرۆڤ، شت)؛
قەلاچۆکەر؛ فەوتێنەر. بەتایبەتی: (ا) کەسێك کە پیشەی نەناوبردنی جانەوەری
ناوماڵە. (ب) دەرمانێك کە جانەوەری ناوماڵی پێ دەکوژرێت.

**extern** (ek′stẽrn, ik-stûrn′), *n.* پزیشکێك کە لە نەخۆشخانەیەك
کار بکات بەڵام لە دەرەوە بژی.

**external** (ik-stûr′n'l), *adj.* (١) دەرەکی؛ دەرەوە؛ دەرینە؛ هی دەرەوە.
(٢) تەنها لە دەرەوەی لەش دەدرێت (دەرمان):
*( a medicine for ~ use only)*
(٣) دەرەکی *( an ~ force)*.
(٤) ناسەرەکی؛ هی دەرەوە: *( ~ factors)*.
(٥) ڕووالەت؛ ڕووکەش؛ ڕووکار: *( ~ politeness)*
(٦) تایبەتی بە کاروباری وڵاتە بیگانەکان؛ دەرەوە:
*( the minister of ~ affairs)*

*n.* (١) ڕوو؛ دیوی دەرەوە؛ بەشی دەرەوە.
(٢) (*pl.*) ڕووالەت؛ سەرزاری؛ ڕووکەش: *( He judges by mere ~s.)*.

**externality** (ek′stẽr-nal′ə-ti), *n.* (١) دەرەکیتی؛ دەرەوەیی.
(٢) (*pl.*) شتێکی دەرەکی یا دەرەوەیی

**externalize** (ik-stûr′n'l-īz′), *v.t.* (١) کردن بە دەرەکی؛
خستنەڕوو؛ خستنە دەرەوە.
(٢) (ا) لە خۆ دوورخستنەوە؛ دوورگرتن لە خۆ: *( to ~ pain)*.
(ب) کردن بە کۆڵی کەسێك یا شتێکی ترەوە (ژێرکەوتن، کەموکووڕی).

**-externalization** *(n.).*

**externally** (ik-stûr′n'l-i), *adv.* لە دەرەوە؛ بە ڕووالەت؛ لەڕوو.

**extinct** (ik-stiŋkt′), *adj.* (١) (ا) کوژاوە (ئاگر، ڕووناکی):
*( an ~ fire)*
(ب) خامۆش (ئاگرپژێن): *( an ~ volcano)*.
(ج) مردوو (هەست): نەماو: *( ~ feelings)*.
(٢) لەناوچوو؛ قڕتێکەوتوو؛ نەماو؛ کوێربووەوە (وەجاخ)؛ بنبڕبوو:
*( an ~ people, animal, species, etc.)*

**extinction** (ik-stiŋk′shən), *n.* (١) کوژاندنەوە؛ کوژانەوە
(٢) قڕتێکەوتن؛ نەمان؛ لەناوچوون؛ دوابڕان.
(٣) بەڕیاکردن؛ لەناوچوون؛ لەناوبردن؛ کوشتن؛ نەهێشتن؛ نەمان؛ فەوتان؛
لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان: *( a people faced with ~ )*.

**extinctive** (ik-stiŋk′tiv), *adj.* کوژێنەرەوە؛ خامۆشکەر

**extinguish** (ik-stiŋ′gwish), *v.t.* (١) کوژاندنەوە (ئاگر)
*( Please, ~ the fire when you leave.)*
(٢) لەناوبردن؛ نەهێشتن؛ دوایی پێ هێنان:
*( to ~ hope, love, life, passions, etc.)*
(٣) داپۆشین؛ کردن بە ژێرەوە: *( Her beauty ~ed all others.)*.
(٤) بەتاڵ کردنەوە؛ لەکارخستن.

**extinguisher** (ik-stiŋ′gwish-ẽr), *n.* (١) ئاگرکوژێن؛ کوژێن؛
کوژێنەرەوە (مرۆڤ، ئامێر، شت)؛ خامۆشکەر: *( a fire ~ )*.
(٢) مۆم کوژێن (بە سەرنانەوەی)

**extirpate** (ek′stẽr-pāt′, ik-stûr′pāt), *v.t.* (١) لە ڕەگ دەرهێنان؛
لە ڕەگ هەڵکێشان؛ ڕیشە دەرهێنان؛ لە بنج دەرهێنان: *( to ~ weeds)*.
(٢) لەناوبردن؛ نەهێشتن؛ فەوتاندن: *( to ~ a social evil)*.

**-extirpation** *(n.)*; extirpative *(adj.)*; extirpator *(n.)*.

**extol, extoll** (ik-stōl′, ik-stol′), *v.t.* ستایش کردن؛ چاکە وتن؛
بە شان و باهودا هاتن؛ هەڵکێشان.

**-extoller** *(n.).*

**extort** (ik-stôrt′), *v.t.* پارە لێ سەندن بەزۆر یا بە هەڕەشە؛
ڕووتاندنەوە (بە بەکارهێنانی دەسەڵاتی پلەوپایە)؛ بەزۆر لێ سەندن:
*[ to ~ money ( or a confession) from ]*

**extortion** (ik-stôr′shən), *n.* (١) پارە لێ سەندن بەزۆر یا بە هەڕەشە
(٢) پارە یا شتێکی بەزۆر لێ سەنراو.

**extortionate** (ik-stôr′shən-it), *adj.* (١) بەزۆر یا بە هەڕەشە
لێ سەنراو. (٢) گران؛ گرانبەها؛ ئێجگار زۆر (نرخ): *( an ~ price)*.

**extortioner** (ik-stôr′shən-ẽr), *n.* = extortionist.

**extortionist** (ik-stôr′shən-ist), *n.* کەسێکی بەزۆر یا بە هەڕەشە
پارە لێ سەند؛ ڕووتێنەرەوە

**extra** (eks′trə), *adj.* زیاتر، باشتر، یا گەورەتر لە ئاسایی؛ سەرئاسا؛
خاترانە؛ زیادە؛ سەربار.

*n.* کەسێك یا شتێکی زیادە: (ا) (*pl.*) مزی سەربار یا زیادە.
(ب) دانەیەکی تایبەتی و زیادەی ڕۆژنامەیەك (بە بۆنەی دەنگوباسێکی گرنگ و
تازەوە). (ج) کرێکارێکی زیادە. (د) شتێکی نایاب
(هـ) ئەکتەرێك کە بەکرێ دەگیرێت بۆ خۆنوواندن لە نمایشێکی گشتی یا
جەماوەریدا.

*adv.* بەتایبەتی؛ یەکجار؛ ئێجگار؛ زۆر *( ~ good quality)*.

**extra-** (eks′trə), پێشگرێکە بەمانای: زیاتر لە؛ جگە لە؛ زیاتر لەوەیش:
*( extracurricular, extramarital)*

**extract** (iks-trakt′), *v.t.* (١) (ا) دەرهێنان؛ هەڵکێشان؛ دەرکێشان.
*( A dentist ~s teeth.)*
(ب) بەزۆر لێ دەرهێنان، لێ دەرکێشان، یا لێ سەندن (بەڵێن، دەنگوباس،
پێ لێنان): *( We ~ed a promise from him.)*.
(٢) لێ دەرهێنان (شیلە، خۆشاو)؛ پوختەکردن؛ دەرهێنان:
*( to ~ juice from fruit)*
(٣) ئەنجام لێ وەرگرتن؛ ئەنجام بۆ دەرکەوتن.
(٤) لێ وەرگرتن (هەڵبژاردەیەك لە پەڕتووکێك)؛ لێ هەڵبژاردن.
(٥) دۆزینەوە یا دەرهێنانی ڕەگی ژمارەیەك (بیرکاری).

*n.* شتێکی دەرهێنراو: (ا) پوختەی خواردەمەنییەك؛ پوختە.
(ب) هەڵبژاردەی پەڕتووکێك

-extractable *(adj.)*; extractible *(adj.)*.

**extraction** (iks-trak′shən), *n.* (١) دەرهێنان؛ هەڵکێشان.
(٢) بنەچە؛ ڕەگەز؛ بنچینە؛ ڕەگ *( He is of French ~.)*.
(٣) پوختە؛ شتێکی دەرهێنراو

**extracurricular** (eks′trə-kə-rik′yoo-lẽr), *adj.* لە بەرنامەی
خوێندن بەولاوە؛ زیاد لە بەرنامەی خوێندن: *( ~ activities in college)*

**extradite** (eks′trə-dīt′), *v.t.* (١) ناردنەوەی گومانبارێك یا تاوانبارێك
بۆ وڵاتەکەی خۆی (یا ئەو وڵاتەی کە گوایە تاوانەکەی تێدا کردووە) بۆ دانی
بە دادگا. (٢) پەسەندکردنی ئەم جۆرە ناردنەوەیە لەلایەن ئەو وڵاتەوە کە
گومانبار یا تاوانبارەکەی لێیە و بووە بە پەنابەر تێیدا.

extraditable *(adj.)*.

**extradition** (eks′trə-dish′ən), *n.* ناردنەوەی تاوانبار، گومانبار،
یا بەندێك بۆ وڵاتەکەی خۆی یا ئەو وڵاتەی کە گوایە تاوانەکەی تێدا کردووە
بۆ دانی بە دادگا؛ دانەوەدەستی گومانبار.

**extrados** (eks-trā′dos), *n.* دیوی دەرەوەی بەشە چەمارەکەی
کەوانەیەك (خانووسازی).

**extramural** (eks′trə-myoor′əl), *adj.* لە دەرەوەی سنووری
شارێك یا زانکۆیەك: *( ~ classes)*.

**extraneous** (iks-trā′ni-əs), *adj.* (١) بیگانە؛ دەرەکی؛ هی دەرەوە:
*( an ~ substance)*
(٢) بێ پەیوەندی (باس، لێکۆڵینەوە)؛ جیا؛ پەیوەندی بە باسەکەوە نییە.

**extraordinary** (iks-trôr′d'n-er′i), *adj.* (١) سەرئاسا؛ نائاسا؛
لە ئەندازە بەدەر؛ بێ ئەندازە: *( a man of an ~ talent; an ~ event)*.
(٢) سەرئاسا و تایبەتی *[ an envoy (ambassador) ~ ]*.

-extraordinarily *(adv.)*.

**extrapolate** (eks′trə-pə-lāt′), *v.t. & v.i.* خەمڵاندن، لێکدانەوە،
یا هەڵسەنگاندن بەپێی ئەو زانیارییەی کە هەیە:
*( Sales figures for next year may be ~d from the known*

***sales figures for preceding years.)***
**-extrapotation** ***(n.).***
**extrasensory** (eks´trə-sen′sə-ri), ***adj.*** له هەستپێکردن بەدەر؛ له سنووری هەستپێکردنی ئاسایی بەدەر.
**extraterritorial** (eks′trə-ter´ə-tôr′i-əl, eks´trə-terə-tō′-ri-əl), ***adj.*** له دەرەوەی سنووری وڵات.
**extraterritoriality** (eks′trə-ter´ə-tôr´i-al′ə-ti, eks′trə-ter´ə-tō´ri-al′ə-ti), ***n.*** (١) لەژێر دەسەڵاتی ئەو وڵاتەدا نەبوون کە تێیدا دەژیت وەك باڵیۆز. (٢) دەسەڵات بوونی وڵاتێك بەسەر هاووڵاتییەکانیدا له دەرەوەی وڵات
**extravagance** (iks-trav′ə-gəns), ***n.*** (١) زیادەڕۆیی (وتە، دووان، کردەوە رەووشت)؛ له تام بەدەری (ڕەفتار، دووان، کردان)؛ له سنوور بەدەری؛ نابەجێیی (٢) دەستبڵاوی؛ پارە بەفیڕۆدان؛ پارە لەبەردان.
**extravagant** (iks-trav′ə-gənt), ***adj.*** (١) نابەجێ (ڕەفتار، کردەوە، نرخ... هتد)؛ له سنوور بەدەر؛ زیادەڕۆ؛ له تام بەدەر:
***( ~ behavior, laughter, praise, prices, etc.)***
(٢) دەستبڵاو؛ پارە بەفیڕۆدەر؛ پارە لەبەردەر: ***( an ~ man)*** .
**extravaganza** (iks-trav′ə-gan′zə), ***n.*** (١) بەرهەمێکی وێژەیی یا شانۆگەری پڕ له گاڵتەوگەپ و ڕازاوەو دوور له ژیانی ڕاستەقینە.
(٢) نواندنێك یا نمایشێکی نێجگار ڕازاوەی پڕ له مۆسیقا.
**extravert** (eks′trə-vũrt´), ***n.*** = **extrovert.**
**extreme** (iks-trēm′), ***adj.*** (١) ئەوپەڕ؛ پەڕی ئەوپەڕ (جێگە)؛ دوورترین (٢) دوا؛ دواترین.
(٣) زۆر؛ له ئەندازە بەدەر؛ بێ ئەندازە؛ ئەوپەڕ (چۆنێتی):
***( ~ patience, kindness, love, etc.)***
(٤) توندوتیژ.
(٥) پەڕگر؛ توندڕەو؛ سەرپەڕ: ***( ~ views or ideas; the ~ left)*** .
***n.*** (١) له ئەندازە بەدەری؛ بێ ئەندازەیی؛ له سنوور بەدەری؛ زیادەڕۆیی.
(٢) ئەوپەڕی (٣) کردەوەیەکی له ڕادە بەدەر. (٤) ئەم پەڕو ئەوپەڕ.
(٥) سەرپەڕی؛ توندڕۆیی؛ پەڕگری. (٦) ڕێژەی ئەوپەڕی (بیرکاری).
**go to extremes,** زیادڕەوی له وتن و کردندا؛ ئەوپەڕ گرتن؛ له ئەندازە بەدەربوون له کردەوەو دوواندا؛ به هیچەوە نەوەستان.
**in the extreme,** زۆر؛ هەتا بڵێی؛ نێجگار؛ یەکجار زۆر؛ بێ ئەندازە:
***( He is annoying in the extreme.)***
**extremely** (iks-trēm′li), ***adv.*** زۆر؛ نێجگار زۆر؛ هەتا بڵێی؛ نێجگار؛ له ئەندازە بەدەر.
***( He is ~ poor, kind, patient, bright, happy, etc.)***
**extremism** (iks-trēm′i-z'm), ***n.*** سەرپەڕی؛ توندڕەوی؛ پەڕگری؛ زیادەڕۆیی؛ توندڕەوی.
**extremist** (iks-trēm′ist), ***n.*** سەرپەڕ (بەتایبەتی له ڕامیاریدا)؛ پەڕگر؛ زیادەڕۆ؛ توندڕەو
***adj.*** تایبەتی بە کەسێکی سەرپەڕ یا پەڕگر؛ تایبەتی بە سەرپەڕی.
**extremity** (iks-trem′ə-ti), ***n.*** (١) ئەوپەڕ (شوێن، شت)؛ دوا
(٢) ئەوپەڕ (پلە)؛ زۆرترین؛ گەورەترین.
(٣) ئەوپەڕی پێویستی یا مەترسی؛ پێویستی ترین؛ مەترسی ترین.
(٤) مردن
(٥) (*pl.*) کردارێکی ناچاری یا ئەوپەڕی:
***( We must resort to ~ies when all else falls.)*** .
(٦) (*pl.*) دەست و قاچ: ***( the ~ies of the body; his ~ies)*** .
**extricate** (eks′tri-kāt´), ***v.t.*** (١) دەرهێنان؛ بەردان؛ ڕزگارکردن؛ کشاندنەوە؛ دەربازکردن (له ناخۆشی یا ئاڵۆزی):
***( to ~ an animal from a net or oneself from difficulties or from an embarrassment)***
(٢) بوون بەهۆی لێوە هاتنەدەرەوە یا لێ هاتن (گەرمایی، گاز).
**-extricable** ***(adj.)***; **extrication** ***(n.).***

**extrinsic** (eks-trin′sik), ***adj.*** (١) دەرەکی؛ له دەرەوەیە؛ دەرەوە. (٢) له سرووشتی بنچینەیی یا گەوهەری مرۆڤێك، شتێك، یا بیروباوەڕێك نییە؛ ناگەوهەری؛ ناسەرەکی.
**-extrinsically** ***(adv.).***
**extro-** (eks′trə), پێشگرێکە بەمانای: دەرەکی؛ بەرەو دەرەوە.
**extroversion** (eks´trō-vũr′zhən), ***n.*** ڕووکراوەیی (مرۆڤ)؛ ڕوو له دەرەوەیی؛ ڕووخۆشی.
**extrovert** (eks′trō-vũrt´), ***n.*** کەسێکی ڕوو له دەرەوە؛ ڕووکراوە؛ ڕوو بەدەرەوە؛ سەر بەدەرەوە.
**extrude** (iks-trōōd′), ***v.t.*** (١) فڕێدانە دەرەوە؛ پاڵ پێوەنان بۆ دەرەوە. (٢) له قاڵب دان (کانزا، پلاستیك).
***v.i.*** سەرهێنانەدەرەوە؛ سەردەرکێشان؛ دەرپۆقین.
**-extrusion** ***(n.)***; **extrusive** ***(adj.).***
**exuberance** (ig-zōō′bẽr-əns, ig-zū′bẽr-əns), ***n.*** (١) زۆری (جۆش، کەیف، خۆشی)؛ فرەیی؛ زەبەنەیی. (٢) جۆش؛ کەیف؛ بەجۆش؛ بەکەیفی؛ کردەوەی بەجۆش: ***( an ~ of feeling, high spirit, etc.)*** .
**exuberancy** (ig-zōō′bẽr-ən-si, ig-zū′bẽr-ən-si), ***n.*** = **exuberance.**
**exuberant** (ig-zōō′bẽr-ənt, ig-zū′bẽr-ənt), ***adj.*** (١) فرە؛ زۆر؛ زەبەنە: ***( ~ vegetation)*** .
(٢) بەجۆش؛ بەکەیف؛ بە شەوق و شادو تەندرووست: ***( an ~ person)***
(٣) پڕ له شەوق و شادی؛ پڕ له کەیف و خۆشی (هەست، سرووشت، هەڵوێست): ***( ~ spirits)*** .
**exuberate** (ig-zōō′bə-rāt´, ig-zū′bə-rāt´), ***v.i.*** پڕبوون و لێ ڕژان (جۆش، کەیف خۆشی، چالاکی)؛ هاتنەجۆش.
**exudate** (eks′yoo-dāt´), ***n.*** شتێکی دەردراو یا لێ هاتووە دەرەوە (ئارەق، بۆن، گاز).
**exudation** (eks´yoo-dā′shən), ***n.*** (١) دەردان (ئارەق)؛ لێ هاتنەدەرەوە (بۆن). (٢) شتێکی دەردراو یا لێ هاتووە دەرەوە (ئارەق، بۆن، گاز، جۆش).
**exude** (ig-zōōd′, ik-sūd′), ***v.i. & v.t.*** (١) لێ تکان؛ دەڵاندن؛ دادان؛ لێ چوون؛ ئاوەزێ کردن؛ دەردان؛ لێ هاتنەدەرەوە (ئارەق، بۆن):
***( to ~ sweat; Sweat ~s through the pores.)***
(٢) نوواندن (کەیف، خۆشی، جۆش)؛ پیشاندان بە زۆری؛ لێ بوونەوە یا لێ هاتنەدەرەوە (خۆشی): ***( He ~s good feelings.)*** .
**exult** (ig-zult′), ***v.i.*** شادبوون؛ له خۆشیدا باڵ گرتن:
***( to ~ in a victory)***
**exultant** (ig-zul′t'nt), ***adj.*** شاد؛ شادمان.
**exultation** (eg´zul-tā′shən, ek´sul-tā′shən), ***n.*** شادی؛ دڵخۆشییەکی بێ ئەندازە؛ هەست بە سەرکەوتن و شادمانی کردن.
**eye** (1), ***n.*** (١) چاو؛ دیدە.
(٢) دەوروپشتی چاو: ***( He got a black ~ in the fight.)***
(٣) بینایی؛ هێزی بینین؛ ماوەی بینین.
(٤) سەیرکردنێك. (٥) تێبینین؛ بینین.
(٦) هەستی هەڵسەنگاندن بە چاو؛ توانای خەمڵاندن بە چاو:
***( a good ~ for distance)***
(٧) (*pl.*)، له بەرچاو؛ له بەردەم:
***( in the ~s of the law, the people, the society, etc.)***
(٨) شتێکی وەك چاو: (ا) چاوگی پەتاتە. (ب) کونی دەرزی.
(ج) ناوچەقی نیشانێك. (د) کونی ئامێرێك بۆ دەسك تێخستنی.
(٩) ناوچەقی گەردەلوول یا باوبۆرانێکی دەریایی (کە هێمن و بای توندو خێرا بە دەوریدا دەخولێتەوە): ***( the ~ of the storm)*** .
***v.t.*** (١) سەیرکردن؛ تەماشاکردن؛ تێبینین. (٢) کون تێکردن.
***v.i.*** [Obs.], وا دەرکەوتن؛ وا هاتنە بەرچاو.
**an eye for an eye,** هەق بە هەق؛ تۆڵە سەندنەوەیەك کە هاوتای

تاوانەکە بێت

**catch one's eye,** سەرنج ڕاکێشان

**feast one's eyes on,** زاخاوی چاو دانەوە؛ زۆر بە ئارەزوو سەیرکردن تا چاو لە شتێک تێر دەبێت.

**give ( a person ) the eye, [Slang],** سەیرکردنی کەسێک بە حەز یا هەستی جووت بوونەوە؛ چاوبازی کردن؛ چاوبڕکێ کردن.

**have an eye for,** توانای پاک‌وپیس کردن هەبوون؛ ناسین؛ حەزلێکردن؛ ئاش بینین: *( He has an eye for beauty.)* .

**have an eye to,** گوێ پێدان؛ چاو لێوە بوون؛ مەبەست بوون.

**in the eye of the law,** لە بەرچاوی یاسا؛ لە بەردەمی یاسادا.

**in the public eye,** (١) لە بەرچاوە؛ زۆر بەدەرەوەیە؛ لە بەرچاوی خەڵکە. (٢) بەناوبانگ؛ ناسراو؛ بەناو.

**keep an eye on,** چاودێری کردن؛ چاو لێوە بوون؛ ئاگاداری کردن.

**keep one's eyes open,** وریابوون؛ ئاگاداربوون؛ ئاگا لەخۆ بوون.

**lay ( or set ) eyes on,** چاوپێکەوتن؛ سەیرکردن؛ بینین.

**make eyes at,** چاوبازی کردن؛ چاوبڕکێ کردن؛ بە حەزەوە سەیرکردن.

**open one's eyes,** چاوکردنەوە (بۆ بینینی ڕاستی)؛ ڕاستی بۆ دەرکەوتن

**run one's eyes over,** بە پەلە سەیرکردن

**see eye to eye,** هەڵوێست و بیروباوەڕ وەك یەك وابوون؛ کۆك بوون:

*( We see eye to eye.; They don't see eye to eye.)*

**see with half an eye,** بە ئاسانی بینین؛ بە لەتە چاوێك بینین؛ ئاشکرابوون

**set eyes on,** چاوپێکەوتن؛ بینین؛ سەیرکردن

**shut one's eyes to,** چاو لێ قووچاندن؛ چاو لێ پۆشین؛ گوێ پێ نەدان.

**with an eye to,** سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان؛ بەلاوە گرنگ بوون؛ بایەخ پێدان

**eyeball** (ī′bôl′), *n.* چاو؛ ناوەڕاستی چاو.

**eyebrow** (ī′brou′), *n.* برۆ؛ ئەبرۆ

**eyed** (īd), *adj.* چاودار *( blue- ~ )* .

**eyedrop** (ī′drop′), *n.* دەرمانی چاو

**eyedropper** (ī′drop′ēr), *n.* دڵۆپێن؛ دڵۆپەر؛ دڵۆپێنەر

**eyeful** (ī′fool′), *n.* (١) پڕ چاو *( an ~ of water)* . (٢) سەیرکردنێك؛ ئەوەندەی کە بە یەك سەیرکردن دەبینرێت. (٣) [Slang]، کەسێك یا شتێکی جوان و سەرنج ڕاکێش.

**get an eyeful, [Colloq.],** (١) چاو لێ تێرخواردن؛ تێر سەیرکردن. (٢) شتێکی زۆر سەیرو جوان بینین.

**eyeglass** (ī′glas′, ī′gläs′), *n.* (١) گەردبینی چاویلکە؛ شووشەی چاویلکە. (٢) (*pl.*) چاویلکە؛ عەینەك: *( He wears ~es.)* .

**eyehole** (ī′hōl′), *n.* (١) چاڵایی چاو؛ ئەو چاڵاییەی کە چاوی تێدایە. (٢) کونە چاو: کونێکی بچووکە لە دەرگای دەرەوەدا سەیری دەرەوەی لێوە دەکرێت بۆ ناسینی ئەو کەسەی لە دەرگا دەدات پێش ئەوەی دەرگای لێ بکرێتەوە. (٣): کون.

**eyelash** (ī′lash′), *n.* برژانگ؛ برژانگی چاو؛ برژۆڵە.

**eyeless** (ī′lis), *adj.* کوێر؛ بێ چاو.

**eyelid** (ī′lid′), *n.* پێڵووی چاو؛ پێڵوو؛ پەردەی چاو.

**eye opener,** (١) چاوکەرەوە (دەنگوباس، ڕاستییەك، کردەوە، ڕووداو). (٢) [Slang]. خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر کە سەر لە بەیانی بخورێتەوە.

**eyepiece** (ī′pēs′), *n.* گەردبینی دووربین یا تێلیسکۆپ.

**eyepit** (ī′pit′), *n.* چاڵایی چاو

**eyeshot** (ī′shot′), *n.* مەودای چاوبڕکردن.

**within eyeshot,** بە چاو دەبینرێت؛ چاو بڕدەکات بۆی

**eyesight** (ī′sīt′), *n.* (١) بینایی؛ دیدە؛ هێزی بینین: *| a person with good ( or poor ) ~ |* (٢) مەودای چاوبڕکردن.

**eyesore** (ī′sôr′, ī′sōr′), *n.* شتێکی ناشرین؛ شتێك کە پیاو قێزی لێ بێتەوە سەیری بکات لەبەر ناشرینی.

**eyestrain** (ī′strān′), *n.* ماندووبوونی چاو.

**eyetooth** (ī′tōōth′), *n.* کەلبە.

**eyewash** (ī′wôsh′, ī′wäsh′), *n.* (١) دەرمانی چاو شتن. (٢) [Slang]، (ا) قسەی هیچ‌وپووچ. (ب) مەرایی؛ کلکەلەقێ. (ج) کردەوە یا ووتەی ساختەو هەڵخەڵەتێنەر.

**eyewink** (ī′wiŋk′), *n.* (١) چاوداگرتن؛ چاوهەڵتەکان. (٢) هەناسەیەك (کات).

**eyewitness** (ī′wit′nis), *n.* گەواە؛ شایەت: *( He was an ~ to the crime.)*

# F f

**F, f** (ef), *n.* (١) تیپی شەشەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە
(٢) دەنگی ئەم تیپە. (٣) دارێژگەیەکی ئەم تیپە
(٤) شەشەم شت لە لیستەیەکدا؛ شەشەم.
*adj.* (١) تایبەتی بە F یا f (٢) شەشەم شت لە لیستەیەکدا.
**F** (ef), *n.* (١) شتێک لە وێنەی F دا.
(٢) نمرەی دەرنەچوون (قوتابخانە، زانکۆ).
**Fabian** (fā′bi-ən), *adj.* (١) وریا و پرکێشی نەکەر (جەنگ).
(٢) تایبەتی بە کۆمەڵە یا رێکخراوی " فابی " ئینگلیزی.
*n.* ئەندامێکی کۆمەڵە سۆشیالیستی " فابی " ئینگلیزی
**Fabian Society,** کۆمەڵەیەکی سۆشیالیستی ئینگلیزییە ساڵی
(١٨٨٤) دانرا ئامانجی دامەزراندنی سۆشیالیزم بوو لە رێگەی ئاشتییەوە نەک شۆرش
**fable** (fā′b'l), *n.* (١) چیرۆکێکی پڕ مانا بە زمانی گیاندارەوە
دەگێڕرێتەوە یا دەنووسرێت (٢) (أ) ئەفسانە (ب) شتێکی پڕوپووچ.
(٣) درۆ: شتێکی هەڵبەستراو
*v.i. & v.t.* (١) چیرۆک نووسین بە زمانی گیاندارەوە.
(٢) درۆ هەڵبەستن: درۆکردن (لە شێوەی چیرۆکدا).
**fabled** (fā′b'ld), *adj.* (١) ئەفسانەیی: ئەفسانە؛
لە چیرۆکی ئەفسانەیدایە (٢) درۆ: هەڵبەستراو.
**fabliau** (fab′li-ō′), *n.* هەڵبەستێکی قۆشمەی ڕاستیخواز
(وێژەی فەرەنسی و ئینگلیزی).
**fabric** (fab′rik), *n.* (١) شیرازە؛ چوارچێوە؛ پێکهات؛ دەق
*( the ~ of society; the social ~ )*
(٢) نەخشە؛ شێواز.
(٣) کووتاڵ؛ کاڵا؛ قوماش.
**fabricant** (fab′ri-kənt), *n.* دروستکەر: شتومەک دروستکەر
**fabricate** (fab′ri-kāt′), *v.t.* (١) دروستکردن (خانوو، شتومەک)؛
کردن (٢) پێکەوەنان؛ پێکهێنان (لە گەلێک پارچە): *( We ~ engines.)* .
(٣) هەڵبەستن؛ درۆ هەڵبەستن؛ رێکخستن (درۆ، چیرۆک)؛ داتاشین؛
رێکخستن درۆ *( to ~ a story)* .
**fabrication** (fab′ri-kā′shən), *n.* (١) دروستکردن (خانوو،
شتومەک)؛ پێکەوەنان. (٢) هەڵبەستن (درۆ)؛ داتاشین؛ رێکخستن (درۆ).
(٣) هەڵبەست (درۆ)؛ هەڵبەستراو؛ درۆ؛ داتاشراو؛ رێکخراو.
**fabricator** (fab′ri-kā′tēr), *n.* (١) دروستکەر (خانوو، شتومەک)
(٢) درۆزن: درۆهەڵبەست.

**fabulist** (fab′yoo-lis), *n.* (١) چیرۆکنووس بە زمانی زیندەوەرەوە؛
کەسێک کە چیرۆکێکی وەها دەگێڕێتەوە. (٢) درۆزن؛ کەسێکی درۆکەر
**fabulous** (fab′yoo-ləs), *adj.* (١) ئەفسانەیی.
(٢) بڕوای پێ ناکرێت؛ سەرسووڕمێنەر: *( a ~ story)* .
(٣) نایاب؛ زۆر جوان و نایاب؛ زۆر خۆش؛ زۆر باش:
*( a ~ person, party, place, time, etc.)*
**façade** (fə-säd′), *n.* (١) ڕووی خانوو؛ دیوی دەرەوەی خانوویەک.
(٢) ڕووکەش؛ ڕووی شتێک؛ ڕووکار؛ ڕووکاری؛ ڕووە درۆزنە.
**face** (fās), *n.* (١) دەموچاو. (٢) ڕووخسار؛ چارە؛ ئێسک؛ شێوە.
(٣) ڕوو؛ ڕووکار؛ دیوی دەرەوە؛ دیو.
(٤) ئابڕوو؛ حەیا؛ سەربەرزی؛ ڕێز: *( to lose ~ ; to save one's ~ )*
(٥) بەهای بەناوی پارە یا قەواڵەیەک؛ نرخی سەر ڕووی پارەیەک. *( ~ value)*
(٦) شێوەی زەوی؛ بەرز و نزمی شێوەی ناوچەیەک.
(٧) دەمی ئامێرێک، واتە ئەو دیوەی کاری پێ دەکرێت (چەقۆ، تەور).
(٨) [Colloq.]، شێوانی دەموچاو (بۆ گاڵتەوگەپ)؛ گرژی دەموچاو.
(٩) [Colloq.]، چاوقایمی؛ بێ شەرمی؛ بێ حەیایی:
*( How can you have the ~ to say such a thing?)*
(١٠) ناوەڕۆکی بڕوانامەیەک (دادگا).
(١١) بنەتای خەنەق یا تونێلێک (کانزاکاری).
(١٢) ڕووی تیپێک (چاپەمەنی).
*v.t.* (١) ڕووتێکردن؛ بەرەو شوێنێک بوون یا ڕوانین:
*( The building ~s the square.)*
(٢) بەرەوڕووبوونەوە؛ تووش بوون؛ هاتنەڕێ.
(٣) ڕووبەڕوو وەستان؛ بەرەنگاربوون.
(٤) ئامادەبوون بۆ ڕووبەڕوو وەستانی شتێک یا ڕووداوێک و چارەکردنی
(٥) بەرگ تێگرتن؛ سواغدان.
(٦) لێدان (بۆیە).
(٧) هەڵگەڕانەوەی شتێک بە جۆرێک کە دەمەکەی لە سەرەوە بێت.
(٨) پینەلێدان؛ پینەکردنی دیوی دەرەوە.
*v.i.* ڕووتێکردن؛ ڕوو وەرگەڕان بەرەو.
face down, (١) چاوشکاندن؛ بەزاندن (بە بەرەنگاربوون و بە ئازایانە).
(٢) هەڵگەڕاوە؛ دەمەونخوون.
face to face, (١) ڕووبەڕوو؛ بەرەو ڕوو.
(٢) ( ~ with )، زۆر نزیک لێوە.
in the face of, (١) بەرامبەر بە؛ لە ڕووی.
(٢) لەگەڵ ئەوەشدا؛ دژ بە.
on the face of it, بە ڕواڵەت؛ لەوە دەچێت؛ وا دیارە؛
بەپێی ئەوەی کە دەبینرێت.
pull ( or wear) a long face, غەمبار نواندن؛ پەست دیاربوون.
put a bold face on it, خۆ بە ئازا نواندن؛
خۆ بە پشت ئەستوور و نەترس نواندن.
show one's face, هاتن؛ دەرکەوتن؛ خۆ پیشاندان؛ خۆ دەرخستن.
to one's face, بە ئاشکرا؛ لەبەرچاو؛ بەبێ شەرم و شکۆ یا شاردنەوە.
**face card,** کاغەزێکی وێنەداری یاری یا قومار (وەک هی شا، شاژن).
**face lifting,** (١) دەموچاو هەڵگرتن؛ لابردنی چرچ و لۆچی دەموچاو
(پزیشکەوانی جوانکردن). (٢) تازەکردنەوە و جوانکردنی دیوی دەرەوەی شتێک.
**facet** (fas′it), *n.* (١) یەکێک لە ڕووەکانی بەردێکی بەنرخ یا پارچە خشڵ.
(٢) ڕوو؛ لا: *( the ~ of a personality)* .
(٣) یەکێک لە بەشەکانی چاوی ئاوێنەی هەندێ جانەوەر.
**facetious** (fə-sē′shəs), *adj.* بە تەوسەوە؛ گاڵتە؛ گاڵتەچی؛ بە تیز:
*( a ~ remark, person, etc.)*
-facetiously *(adv.)*; facetiousness *(n.)*.
**face value,** (١) بەهای بەناوی پارە یا قەواڵەیەک؛ نرخی سەر ڕووی
پارەیەک. (٢) بەهای بینراو؛ نرخی دیار؛ چۆن دیارە وەها:
*( I took his promise at ~ .)*

**facial** (fā'shəl), *adj.* هی دەموچاو؛ دەموچاو؛ بۆ دەموچاو.
*( ~ expression; ~ message)*
*n.* دەرمان دان لە دەموچاو و شێلانی.
**facile** (fas'l, fas'il), *adj.* (١) ئاسان.
(٢) بە ئاسانی و خێرا شت جێبەجێ دەکات؛ بە هەڵپە:
*( a ~ worke, mind, secretary)*
(٣) گونجاو (مرۆڤ)؛ بە ئاسانی دەگونجێ و شتی پێ دەسەلمێنرێت.
**facilitate** (fə-sil'ə-tāt'), *v.t.* (١) ئاسان کردن؛ ئاسانتر کردن.
(٢) یارمەتیدان؛ رایی کردن (کار)؛ راپەڕاندن (کار).
**-facilitation** *(n.).*
**facility** (fə-sil'ə-ti), *n.* (١) ئاسانی.
*( to play the piano with ~ )*
(٢) کارامەیی؛ لێهاتوویی؛ توانا:
*( to have great ~ in learning languages)*
(٣) نەرمی (مرۆڤ)؛ گونجان و ڕووخۆشی.
(٤) *(pl.)*، هۆی ئاسان کردن؛ هۆی یارمەتی؛ هۆی ژیان ئاسان کردن لە ماڵدا (ناودەست و چێشتخانە... هتد):
*( good transportation ~ies; educational ~ies)*
**facing** (fās'iŋ), *n.* (١) پارچە قوماشێك کە دەدرێت لە دیوی ناوەوە یا دەرەوەی جل و بەرگ بۆ جوانی یا پاراستن.
(٢) سواغ؛ شتێك کە دەدرێت لە دیوی دەرەوەی دیوارێك بۆ جوانی یا پاراستن:
*( a brick wall with a ~ of concrete)*
(٣) *(pl.)*، ڕوو وەرگەڕان (مەشقی سەربازی).
(٤) *(pl.)*، گێزوگوڵنگی چاکەتی ئەفسەر.
**facsimile** (fak-sim'ə-li), *n.* وێنەی دەقاودەق (وێنە، دەستنووس، پەرتووك... هتد).
*v.t.* وێنەی دەقاودەق دەرهێنان.
**in facsimile,** بە دەقاودەقی؛ بە تەواوی؛ بەبێ کەم و زیاد.
**fact** (fakt), *n.* (١) کردەوە؛ کردار.
(٢) ڕووداوێکی ڕاست؛ شتێکی ڕاست؛ ئەو شتەی ڕوویداوە.
(٣) ڕاستی؛ ڕاست. *( to distinguish ~ from fiction)*.
**as a matter of fact,** ئەوی ڕاست بێت؛ بە ڕاستی؛ بێ گومان.
**in fact,** ئەوی ڕاست بێت؛ بە ڕاستی؛ بێ گومان.
**in point of fact,** ئەوی ڕاست بێت؛ بە ڕاستی؛ بێ گومان.
**faction** (fak'shən), *n.* (١) دەستە (حیزب، ڕێکخراو)؛ تاقم؛ لق؛ دەستەی جیابووەوە. (٢) دووبەرەکی (حیزب، ڕێکخراو)؛ دووبەرەکێتی؛ لێ جیابوونەوە
**factional** (fak'shən-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە دووبەرەکی حیزبی؛ هی دەستە دەستە. *( ~ fighting)*.
(٢) دووبەرەکیکەر؛ دووبەرەکی خەرەوە.
**factionalism** (fak'shən-əl-iz'm), *n.* دووبەرەکێتی؛ شەڕی دووبەرەکێتی.
**factious** (fak'shəs), *adj.* (١) دووبەرەکیکەر؛ دووبەرەکی خەرەوە.
(٢) تایبەتی بە دووبەرەکی؛ بەش بەش؛ دەستە دەستە.
**factitious** (fak-tish'əs), *adj.* دەرۆزنە؛ درۆ؛ دەستکرد؛ ساختە.
*( ~ enthusiasm, needs, etc.)*
**factor** (fak'tēr), *n.* (١) دەلاڵ؛ وەکیل (٢) هۆ؛ هۆکار.
(٣) جین (زیوارناسی)؛ شانەی زگماك یا توخم پارێز لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەك.
(٤) کۆڵکە؛ کۆڵك (بیرکاری)
**factory** (fak'tə-ri, fak'tri), *n.* (١) کارگە؛ کارخانە؛ فابریقە.
(٢) ئینستگەیەکی بازرگانی لە وڵاتێکی بێگانەدا.
**factotum** (fak-tō'təm), *n.* بەردەستی هەمەکارە؛ کرێکارێك یا بەردەستێك کە سەری لە هەموو کارێك دەربچێت و بیکات.
**factual** (fak'chōō-əl), *adj.* ڕاست؛ ڕاستەقینە؛ ڕاستی.
**faculty** (fak''l-ti), *n.* (١) توانا؛ توانین.
(٢) توانایەکی زگماکی *( the ~ of hearing, speech, etc.)*.
(٣) توانایەکی تایبەتی کە مرۆڤ فێری بووبێت.
(٤) بەشێکی زانیاری زانکۆ یا کۆلیجێك:
*( the ~ of law; the science ~ )*
(٥) هەموو مامۆستایانی قوتابخانە، کۆلیج، یا زانکۆیەك.
(٦) هەموو ئەندامانی پیشەیەکی زانیاری.
(٧) دەسەلات؛ دەسەڵات پێدان؛ دەسەڵاتی پێدراو.
(٨) [Archaic]، پیشە. (٩) بەشەکان یا تواناکانی مێشك.
**fad** (fad), *n.* مۆدە؛ نوێ باو؛ باو؛ مۆدەی سەردەمی.
**faddish** (fad'ish), *adj.* (١) تایبەتی بە مۆدەی سەردەمی.
(٢) حەزکەر لە نوێ باو؛ شوێن مۆدەی سەردەمی کەوتوو؛ مۆدەچی.
**faddist** (fad'ist), *n.* مۆدەچی؛ شوێن کەوتووی مۆدەی سەردەمی.
**faddy** (fad'i), *adj.* = faddish.
**fade** (fād), *v.i.* (١) چوونەوە (ڕەنگ)؛ کاڵ بوونەوە.
(٢) سیس بوونەوە؛ کزبوون؛ کەم بوونەوە.
(٣) لە چاو وون بوون وورده وورده؛ نەمان؛ لەبیرچوونەوە.
*v.t.* (١) چوواندنەوە (ڕەنگ)؛ کاڵ کردنەوە. (٢) لە چاو وون کردن بەرەبەرە.
**fade in.** وورده وورده دەرکەوتن، ڕوون بوونەوە، یا هاتنە بەر گوێ (فیلم، تەلەفزیۆن، ڕادیۆ)
**fade out,** وورده وورده کوژانەوە (فیلم، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن).
**faecal** (fē'k'l), *adj.* = fecal.
**faeces** (fē'sēz), *n.pl.* = feces.
**faerie, faery** (fâr'i), *n.* [Archaic], = fairy.
**fag** (fag), *v.i.* (١) ئیش کردن و ماندووبوون. (٢) بەردەستی کردن.
*v.t.* ئیش پێکردن و ماندووکردن.
*n.* [British Colloq.], (١) (ا) ئیشێکی ناخۆش و گران.
(ب) ماندووبوون؛ ماندوێتی.
(٢) قوتابییەك کە بەردەستی قوتابییەکی تر دەکات کە لە پۆلێکی بەرزتربێت لە خۆی (قوتابخانەی تایبەتی ئینگلیزی).
(٣) [Slang]، لووسکە؛ حیز.
**fag** (fag), *n.* [Slang], جگەرە.
**faggot** (fag'ət), *n. & v.t.* = fagot.
**faggot** (fag'ət), *n.* [Slang], = fag # 3.
**fagot** (fag'ət), *n.* (١) دەستە چیلکە؛ چەپکەدار؛ چیلکە.
(٢) دەستەیەك یا تۆپەڵێك ئاسنی خاو کە بە گەرمی لێی دەدرێت و شیشی لێ دروست دەکرێت.
*v.t.* (١) پێچانەوە؛ چەپك کردن.
(٢) ڕازاندنەوەی دروومان بە دەستە تەقەڵی ڕاست و چەپ.
**fagoting** (fag'ət-iŋ), *n.* جۆرە دروومانێکی ڕازێنەرەوەیە بریتییە لە لێدانی دەستە تەقەڵی ڕاست و چەپ.
**fail** (fāl), *v.i.* (١) کورت هێنان؛ بەش نەکردن؛ نەبوون.
(٢) کزبوون؛ لاوازبوون. *( His sight is beginning to ~ .)*.
(٣) فەرامۆش کردن؛ ئەرك بەجێ نەهێنان.
(٤) سەرنەکەوتن؛ نشوستی هێنان؛ ژێرکەوتن؛ بە ئامانج نەگەیشتن؛ سەرنەگرتن. *( Our plans ~ed.)*.
(٥) نابووت بوون.
(٦) دەرنەچوون (قوتابی)؛ کەوتن: *[ to ~ (in) an examination ]*
*v.t.* (١) دڵشکست کردن؛ نائومێدکردن؛ دەستبەرداربوون:
*( His friends ~ed him.)*
(٢) فریانەکەوتن؛ پشت لێ هەڵکردن؛ نەتوانین:
*( His courage ~ed him.)*
(٣) نەکردن (ئەرك)؛ فەرامۆش کردن (کار).
(٤) (ا) دەرنەچواندن؛ خستن (قوتابی):
*( The teacher ~ed half the students.)*
(ب) دەرنەچوون؛ تێداکەوتن.

*( He ~ed English and Mathematics.)*

***n.*** مسۆگەر؛ دڵنیا؛ بێ گومان؛ لە سەدا سەد:

*( I'll be there at one o'clock without ~ .)*

**failing** (fāl′iŋ), ***n.*** (١) نشوستی؛ ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن.
(٢) کەموکووڕی؛ ناتەواوی؛ نەنگ (ڕەووشت):

*( Drinking was one of his ~s.)*

***prep.*** بەبێ؛ ئەگەر نەبێ. نەکرێت، یا ڕوو نەدات:

*( F~ a rainstorm, the game will be played this afternoon.)*

**fail-safe** (fāl′sāf′), ***adj.*** مەترسی شکان یا کارنەکردنی لێ ناکرێت (مەکینە)

**failure** (fāl′yẽr), ***n.*** (١) کورت هێنان.
(٢) کزبوون؛ کەم بوون؛ شکستی؛ نشوستی هێنان؛ نشوستی.
(٣) فەرامۆشی؛ فەرامۆش کردن؛ نەکردن (ئەرك): *( ~ to obey rules)* .
(٤) ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن
(٥) کەسێکی سەرنەکەوتوو؛ کەسێکی ژێرکەوتوو؛ شتێکی سەرنەکەوتوو یا سەرنەگرتوو. (٦) نابووت بوون.
(٧) (أ) دەرنەچوون (قوتابی)؛ کەوتن (لە قوتابخانەدا).
(ب) نمرەی دەرنەچوون؛ نمرەی کەوتن

**fain** (fān), ***adj.*** [Archaic & Poetic], (١) بەختیار (بە کردنی شتێك)؛ ئامادەو بەدل (٢) نابەدڵ؛ ناچار (بە کردنی کارێك). (٣) بەپەرۆش؛ بەدل.

***adv..*** *( He would ~ stay.)* بەپەرۆشەوە؛ پڕ بەدڵ؛ زۆری پێ خۆش دەبێت:

**faint** (fānt), ***adj.*** (١) لاواز؛ بێ هێز (٢) ترسنۆك.
(٣) بە نابەدڵ (یارمەتی)؛ کز: *( a ~ support)*
(٤) گێژ؛ مزیکی لە هۆش خۆ چوو.
(٥) کز (دەنگ)؛ نادیار. (٦) کز؛ کەم: *( a ~ hope)* .

***n.*** بوورانەوە؛ لە هۆش خۆ چوون؛ بێ هۆش بوون.

***v.i.*** (١) بوورانەوە؛ لە هۆش خۆ چوون؛ بێ هۆش کەوتن.
(٢) [Archaic]. لاوازبوون؛ بێ هێز بوون؛ پووکانەوە.

**faint-heart** (fānt′härt′), ***n.*** کەسێکی ترسنۆك

**faint-hearted** (fānt′här′tid), ***adj.*** ترسنۆك

**fair** (fâr), ***adj.*** (١) جوان *( ~ women)* .
(٢) پاك (دوبانگ، ناو)؛ بێگەرد *( a ~ reputation)* .
(٣) سپی (پێست)؛ زەرد (قژ) *( ~ skin, hair, etc.)* .
(٤) خۆش (ئاووهەوا)؛ خۆشییان؛ سایەقە: *( ~ weather, sky, etc.)* .
(٥) بێ کەندوکۆسپ (ڕێگە)؛ ڕێكوڕەوان (ڕێگا) *( a ~ road)* .
(٦) بەویژدان؛ دادپەروەر؛ هەق پەرست؛ بێ لایەن *( a ~ judge, person)* .
(٧) ڕەوا (بڕیار)؛ هەق: *( a ~ sentence)*
(٨) ڕاوکردنی قەدەغەنییە؛ هەمووکەس بۆی هەیە ڕاوی بکات: *( ~ game)* .
(٩) زۆر؛ نەختێك زۆر؛ نە زۆرو نە کەم: *( a ~ amount)*
(١٠) مام ناوەندی؛ ناوەنجی: *( Her grade was ~ .)* .
(١١) درۆزنە؛ ڕووکەش؛ ساختە؛ هەر بە ڕواڵەت جوان یا باش (ووتە):

*( ~ words)*

***n.*** [Archaic], (١) جوانی (٢) ئافرەتێکی جوان. (٣) شتێکی جوان یا باش.

***adv.*** (١) بە ویژدانانە؛ بەبێ گزی کردن: *( Play ~ .)* .
(٢) یەکسەر؛ بەتەواوی: *( He was struck ~ in the face.)* .

***v.i.*** [Dial.], بوون بە سایەقە

***v.t.*** ساف و لووس کردن (دارو تەختە).

**fair and square,** [Colloq.], ڕەوا؛ هەق؛ بێ ساختەکردن

*( He won the race fair and square.)*

**fair to middling,** [Colloq.], نە باش و نە خراپ (باری ژیان، تەندرووستی) *( How are you? Fair to middling.)* .

**fair** (fâr), ***n.*** (١) کۆبوونەوەی خەڵك لە بازاڕدا بۆ ئاڵوگۆڕکردنی شت و کڕین و فرۆشتن (٢) بازاڕو ئاهەنگ. (٣) پیشانگە (بەتایبەتی هی ڕەرزانە یا ساڵانەی ناوچەیەك بۆ پیشاندانی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی و ملەملێ لەنێوانیاندا بۆ خەڵات بردنەوە).

**fair copy,** پوختەنووس؛ پاکنووس.

**fair-ground** (fâr′ground′), ***n.*** پیشانگا (بەتایبەتی هی بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازی ناوچەیەك یا هی چەرخوفەلەك و یاری تر).

**fairly** (fâr′li), ***adv.*** (١) وەك یەك؛ بە یەکسانی؛ بە ویژدانانە؛ بە هاوتایی.
(٢) مام ناوەندی؛ نەختێك؛ نە باش و نە خراپ:

*( He plays the piano ~ well.)*

(٣) بە ئاشکرا؛ بە ڕوونی.
(٤) بەتەواوی؛ بە یێجکاری؛ یێجکار: *( We were ~ in the trap.)* .
(٥) [Obs.]، بە نەرمی (ڕەووشت)؛ بە جوانی و ناسکی.

**fairness** (fâr′nis), ***n.*** ویژدان؛ هەق؛ ماف پەرستی؛ هەق خوازی؛ ڕەوایی.

**fair-minded** (fâr′mīn′did), ***adj.*** بە ویژدان.

**fair play,** گزی نەکردن؛ ساختە نەکردن؛ بە ویژدانێتی.

**fair sex,** ئافرەت؛ ژن؛ توخمی ناسك و جوان، واتە ئافرەت؛ ژنان.

**fair-spoken** (fâr′spō′kən), ***adj.*** زمان نەرم؛ ناسك (ڕەووشت)؛ ڕەووشت جوان.

**fair-weather** (fâr′weth′ẽr), ***adj.*** (١) تەنها بۆ سایەقە یا ئاووهەوای خۆش باشە. (٢) تەنها لە خۆشیدا پشتی پێ دەبەسترێت؛ لە تەنگانەدا پشتی پێ نابەسترێت؛ بە کاری تەنگانە نایەت (مرۆڤ):

*( ~ friends)*

**fairy** (fâr′i), ***n.*** (١) پەری؛ جنۆکە.
(٢) [Slang]، حیز؛ نێرینەی سووك.

***adj.*** (١) تایبەتی بە پەری. (٢) ناسك.

**fairyland** (fâr′i-land′), ***n.*** (١) پەری نشین.
(٢) شوێنێکی زۆر خۆش و جوان و دڵڕفێن.

**fairy tale,** (١) ئەفسانە؛ چیرۆکی ئەفسانەیی (دەربارەی پەری و گیاندارو کرداری سەرئاسا). (٢) چیرۆکێکی درۆ؛ درۆ؛ چیرۆکێك کە بڕوای پێ نەکرێت

**fait accompli,** کارێکی بڕاوە؛ کارێکی لە کار ترازاو.

**faith** (fāth), ***n.*** (١) بڕوا؛ باوەڕ. (٢) بڕوابوون بە خودا یا بە ئاینێك.
(٣) ئاین؛ ئاینێك: *( the Catholic ~ )* .
(٤) هەرچ شتێك کە بڕوات پێی بێت.
(٥) پشت پێ بەستن؛ بڕواپێکردن؛ باوەڕ پێ بوون:

*( Children usually have ~ in their parents.)*

(٦) دڵسۆزی؛ جگەرسۆزی؛ وەفا.

***interj.*** لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی.

**bad faith,** ناپاکی؛ دووڕوویی؛ پیسی؛ نادڵسۆزی.

**break faith,** (١) ناپاکی کردن؛ دژی بڕوای خۆ جووڵانەوە؛ بەدڕەفتاری کردن. (٢) بەڵێن شکاندن.

**good faith,** پاکی؛ دڵسۆزی؛ سەرڕاستی؛ دڵپاکی.

**in faith,** بە ڕاستی؛ لە ڕاستیدا.

**keep faith,** (١) پاکی لەگەڵ کردن؛ نەگۆڕان؛ پاك بوون لەگەڵدا (مرۆڤ، ڕێباز، بیروڕا، ئاین)؛ بە دڵسۆزی مانەوە. (٢) بەڵێن نەشکاندن؛ پەیمان ڕاگرتن

**faithful** (fāth′fəl), ***adj.*** (١) دڵسۆز؛ بەوەفا.
(٢) پشت پێ بەستراو؛ سەرڕاست.
(٣) بەقاودەق؛ تەواو؛ ڕاست: *( a ~ copy)* .
(٤) [Rare]، ئایندار؛ بە ئاین؛ بڕوادار؛ بەبڕوا.

**the faithful,** (١) ئاینداران؛ خوداناسان؛ بە ئاینان.
(٢) بڕواداران؛ شوێن کەوتووانی دڵسۆز؛ دڵسۆزان.

**faithless** (fāth′lis), ***adj.*** (١) نادڵسۆز؛ بێ وەفا؛ چەوت؛ سەرچەوت.
(٢) پشت پێ نەبەستراو.
(٣) [Rare]، بێ ئاین.

**fake** (fāk), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.], ساختەکردن؛ شتی ساختە یا درۆ بە ڕاست نواندن.

***n.*** [Colloq.], شتێکی ساختە؛ شتێکی درۆزنە یا درۆ.

***adj.*** [Colloq.], ساختە؛ درۆزنە؛ درۆ؛ درۆزنانە.

**fake** (fāk), *n.* ئەلقە (پەت، گوریس).
*v.t.* ئەلقەکردن (پەت، گوریس).
**faker** (fāk′ēr), *n.* ساختەچی؛ ساختەباز؛ کەسێکی ساختە بە ڕاست نیشاندان.
**-fakery** *(n.)*.
**fakir** (fə-kêr′, fā′kēr), *n.* (١) فەقیر: موسوڵمانێکی سوالکەر.
(٢) فەقیر: سۆفی یا دەروێشێکی هیندی.
**falchion** (fôl′chən, fôl′shən), *n.* (١) شمشێرێکی دەم کورتی چەماوە. (٢) [Poetic]، شمشێر.
**falciform** (fal′si-fôrm′), *adj.* چەماوە.
**falcon** (fôl′k'n, fô′k'n), *n.* (١) باز؛ شمقار
(٢) تۆپێکی بچووکی کۆنی جەنگە.
**falconer** (fôl′k'n-ēr, fô′k'n-ēr), *n.* بازەوان؛ ڕاوکەر بە باز
**falconry** (fôl′k'n-ri, fô′k'n-ri), *n.* بازەوانی؛ ڕاوکردن بە باز.
**fall** (fôl), *v.i.* (١) کەوتنەخوارەوە؛ کەوتنەسەر زەوی؛ بەربوونەوە:
*( Apples ~ from the tree.)*
(٢) کەوتن؛ گلان؛ کەوتنەخوارەوە: *( The child stumbled and fell.)* .
(٣) کوژران (جەنگ)؛ برینداربوون: *( Many fell in battle)* .
(٤) ڕووخان؛ هەرەس بردن: *( The building fell.)* .
(٥) شۆڕبوونەوە
(٦) لێدان؛ پێکاندن؛ پیاکێشان:
*( The arrow fell wide of its mark.)*
(٧) (ا) داکەوتن؛ داخستن: *( Her glance fell.)* .
(ب) نزم بوونەوە بۆ ئاو: *( The river ~s to the sea.)* .
(٨) شکان (نرخ، پلەی گەرما)؛ هاتنەخوارەوە:
*( Prices are ~ing.; Her temperature fell.)*
(٩) ڕووخان (میری). *( The government fell.)* .
(١٠) شکان (ناوبانگ)؛ ناوزڕان؛ لەبەرچاوشکان؛ لەبەرچاوکەوتن:
*( She fell in my eyes.)*
(١١) داوێن پیسی کردن (ئافرەت)؛ نابڕووچوون؛ بە پاکی نەمان:
*( She hall fallen.)*
(١٢) گیران (وڵات، شار)؛ کەوتنەژێر دەستەوە؛ کەوتن:
*( Berlin fell to the Allies.)*
(١٣) نەخۆش کەوتن *( The child fell ill.)* .
(١٤) داکەوتن؛ بەست بوون: *( Her face fell.)* .
(١٥) کزبوون؛ کەم بوونەوە: *( Her voice fell.)* .
(١٦) ڕێکەوت کردن؛ ڕوودان: *( The meeting fell on Friday.)* .
(١٧) بە ڕێکەوت بۆ هاتن: *( The prize fell to the lucky girl.)* .
(١٨) بۆ مانەوە (میرات): *( The estate ~s to the widow.)* .
(١٩) کەوتنەسەر (زمانەوانی):
*( The accent ~s on the third syllable.)*
(٢٠) ئاراستەبوون؛ چوون بەرەو:
*( His eye fell on a misspelled word.)*
(٢١) لێوە هاتنەدەرەوە؛ لێ دەرپەڕاندن:
*( The news fell from his lips.)*
(٢٢) لەدایکبوون (گیاندار).
(٢٣) دابەش بوون؛ بابەت بوون:
*( These poems ~ into two classes.)*
*n.* (١) کەوتنەخوارەوە؛ کەوتن؛ هاتنەخوارەوە. (٢) کەوتن؛ گلان.
(٣) شۆڕبوونەوە. (٤) بەرەوخوارە؛ سەربەرەوخوارە.
(٥) شکان (نرخ)؛ هاتنەخوارەوە.
(٦) ڕووخان (میری)؛ هەڵگێرانەوە. (٧) شکان (ناو)؛ ناوزڕان.
(٨) ڕەووشتی سووک نوواندن.
(٩) (ا) لەدایکبوون (گیانەوەر). (ب) ژمارەی بەچکەی بە یەك جار لەدایکبوو.
(١٠) شتێکی وەریو یا کەوتووەخوارەوە: *( a ~ of leaves)* .
(١١) پایز.
(١٢) ئەو هێندەی باریوە (بەفر، باران): *( a six-inch ~ of snow)* .
(١٣) *(pl.)*، تاڤگە.
(١٤) پارچەیەك قوماش کە لە شەپقەی ئافرەتێکەوە لە دواوە شۆڕبووبێتەوە.
(١٥) (ا) بە زەویدا دان هەتا هەردوو شان لە زەوی دەدەن (زۆرانبازی).
(ب) زۆرانبازییەك.
*adj.* تایبەتی بە پایز؛ پایزە: *( ~ weather)* .
**fall apart,** لێکبوونەوە؛ لێکترازان؛ پارچەپارچەبوون؛ هەڵوەشان؛ ڕووخان؛ شکان؛ پەککەوتن.
**fall asleep,** خەولێکەوتن.
**fall away,** (١) وازلێهێنان (ڕێباز، هاوڕێیەتی)؛ دەستبەرداربوون لێی.
(٢) لاوازبوون؛ بێ هێز بوون
**fall back,** کشانەوە؛ گەڕانە دواوە؛ گەڕانەوە.
**fall back on ( or upon),** (١) پشت پێ بەستن. (٢) کشانە دواوە بۆ.
**fall behind,** (١) دواکەوتن (کار، قوتابخانە، گەشت)؛ بەجێمان:
*( to fall behind in one's work)*
(٢) دواکەوتن (قەرزدانەوە)
**fall flat,** ژێرکەوتنێکی تەواو؛ سەرنەکەوتن
**fall for, [Slang],** (١) دڵ لێچوون؛ حەزلێکردن؛ خۆشویستن؛ بەدڵ بوون.
(٢) پێ هەڵخەڵەتان؛ بڕواپێکردن (ساختە، درۆ).
**fall foul ( or afoul ) of,** (١) تێوەگلان؛ تووش بوون.
(٢) بوون بە شەڕ لەگەڵدا. (٣) بەیەکدادان؛ بەیەکداکێشان.
**fall from grace,** داوێن پیسی کردن؛ گوناە کردن؛ خراپەکردن و ڕووڕەش بوون (ئاین).
**fall in,** (١) هەرەس بردن؛ ڕووخان: *( The roof fell in.)* .
(٢) لەگەڵ گونجان؛ ڕێکەوتن لەگەڵ؛ گونجان. (٣) ڕیزبوون.
**fall in love with,** حەزلێکردن (مرۆڤ)؛ دڵ لێچوون؛ خۆشویستن.
**fall in with,** (١) بە ڕێکەوت تووش بوون؛ پێ گەیشتن.
(٢) یەکگرتن؛ پێ گەیشتن و بوون بە یەك لەگەڵدا.
(٣) لەگەڵدا گونجان؛ ڕێکەوتن؛ مل بۆ دان.
**fall off,** (١) کەوتنەخوارەوە (مرۆڤ)؛ بەربوونەوە.
(٢) کەوتنەخوارەوە (میوە) (٣) شکان (نرخ)؛ کزبوون؛ کەم بوونەوە.
(٤) دانەدواوە؛ بە ناخداچوون؛ نشوستی هێنان.
**fall on ( or upon ),** (١) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
(٢) کەوتنەسەر شان (ئەرك):
*( It fell upon him to tell her the sad news.)*
**fall out,** (١) دەمەقاڵێ بوون لەگەڵ؛ ناکۆکی بوون؛ شەڕ لەگەڵ کردن.
(٢) ڕوودان؛ بوون بە ئەنجامی؛ وا ڕێکەوتن.
(٣) لە ڕیز هاتنەدەرەوە؛ ڕیز بەجێهێشتن.
**fall short,** (١) کورت هێنان؛ بەش نەکردن
(٢) ( **~ of** )، پێ نەگەیشتن (ئامانج):
*( He fell short of reaching his goal.)*
**fall through,** سەرنەگرتن؛ ژێرکەوتن؛ ڕێ نەکەوتن:
*( Their plan fell through.)*
**fall to,** (١) دەستپێکردن (کار). (٢) دەست بە خواردن کردن.
(٣) جێگەی خۆ گرتن؛ چوونە جێگەی خۆ.
**fall under,** (١) کەوتنەژێر ڕکێفەوە:
*( She fell under her influence.)*
(٢) بەشێك بوون لە (باس، بابەت، سەرباس).
**fallacious** (fə-lā′shəs), *adj.* (١) چەوت (بیرکردنەوە، بیر)؛ نابەجێ؛ هەڵە: *( ~ reasoning)* .
(٢) بە هەڵەدابەر؛ هەڵخەڵەتێنەر؛ ساختە؛ درۆزنە
**fallacy** (fal′ə-si), *n.* (١) هەڵخەڵەتاندن؛ فریواندن؛ تەفرەدان؛ بەهەڵەدابردن. (٢) هەڵە. (٣) لێکدانەوە بە هەڵە؛ هەڵەکاری.
**fallen** (fôl′'n), *adj.* (١) کەوتوو؛ کەوتووەخوارەوە.

(٢) ڕاکشاو؛ لەسەر زەوی کەوتوو.
(٣) سووك (مرۆڤ، ڕەووشت)؛ ناوزڕاو.
(٤) گیراو (شار، ناوچە)؛ داگیرکراو؛ ڕووخاو (میری).
(٥) وێران کراو؛ ڕووخاو؛ وێران.
(٦) مردوو؛ کوژراو (جەنگ).

**fall guy**, [Slang], قوربانی  کەسێك کە هەڵەو تاوانی کەسێکی تر یا کۆمەڵە یا تاقمێکی دەسەپێنرێت بە سەریدا.

**fallibility** (fal´ə-bil′ə-ti), *n.* لە هەڵە بەدەر نەبوون (مرۆڤ).

**fallible** (fal′ə-b'l), *adj.* لە هەڵە بەدەر نییە (مرۆڤ)؛ بۆی هەیە هەڵە بکات یا بە هەڵەدا بچێت.

**falling sickness,** فێ.

**falling star,** ئەستێرەی کشاو.

**fall-out** (fôl′out´), *n.* (١) بارینی گەردیلەی تیشکاوی ئەتۆمی بۆ سەر زەمین لە پاش تەقینەوەی بۆمبای ئەتۆمی. (٢) ئەم گەردیلە ئەتۆمییانە.

**fallow** (fal′ō), *n.* (١) زەوی کێڵراوو نەچێنراو بۆ وەرزێك (بۆ پشوودانی)؛ زەوی نووستوو؛ بەیار. (٢) کێڵانی زەوی‌و دانانی بۆ وەرزێك بەبێ چاندنی، واتە نوواندنی.
*adj.* (١) نەچێنراو (زەوی)؛ پەروەردە نەکراو.
(٢) خاو (مێشك)؛ پەروەردە نەکراو یا نەخراوە کار (مێشك).
*v.t.* کێڵانی زەوی‌و نوواندنی، واتە نەچاندنی.

**fallow** (fal′ō), *adj.* زەردباو؛ زەردکار؛ زەرد.

**fallow deer,** ئاسکێکی بچووکی بەڵەکاوی ئەورووپاییە.

**false** (fôls), *adj.* (١) ناتەواو؛ درۆ؛ هەڵە: *( a ~ argument, statement, etc.)*
(٢) درۆزن *( a ~ witness)* .
(٣) ناپاك؛ ناڕاست؛ چەوت: *( a ~ friend)* .
(٤) هەڵخەڵەتێنەر
(٥) قەڵب؛ درۆزنە؛ ساختە: *( ~ money)* .
(٦) درۆ؛ هەڵبەستراو؛ ناڕەوا: *( ~ accusations)* .
(٧) درۆزنە؛ دروستکراوە بۆ ساختە، قاچاخچێتی، یا ڕووالەت: *( a ~ drawer; a ~ bottom)*
(٨) ناساز (ئاواز).
*adv.* بە درۆ؛ بە هەڵە؛ بە ساختە؛ بە ناپاکی.
**play ( a person ) false,** هەڵخەڵەتاندن؛ ناپاکی لەگەڵ کردن؛ فریواندن؛ چاوبەستنەوە.

**false bottom,** بنی ساختە یا درۆزنە: بنێکی زیادەیە دەنرێت بە جانتاو چەکمەجەوە بۆ دروستکردنی خانەیەك لەنێوان ئەم بنەو بنە ڕاستەقینەکەدا بۆ شت تێدا شاردنەوە.

**falsehood** (fôls′hood), *n.* (١) درۆ. (٢) درۆزنی؛ درۆکردن.
(٣) بڕوا، بیر، یا تیۆرییەکی درۆ.

**false imprisonment,** بەندکردنی ناڕەوا.

**falsely** (fôls′li), *adv.* بە درۆ؛ بە ساختە؛ بە هەڵە؛ بە ناڕەوایی.

**falseness** (fôls′nis), *n.* درۆزنی؛ ناپاکی؛ چەوتی.

**false teeth,** تاقمە ددان؛ ددانی دەستکرد.

**falsification** (fôl´sə-fi-kā′shən), *n.* گۆڕین بۆ ساختەکردن؛ ساختەکردن.

**falsify** (fôl′sə-fī´), *v.t.* (١) گۆڕین بۆ ساختەکردن (بڕوانامە، تۆمار): *( to ~ records, accounts, etc.)*
(٢) شێواندن‌و تێکدان.
(٣) بەدرۆخستنەوە.
*v.i.* درۆکردن

**falsity** (fôl′sə-ti), *n.* (١) درۆ. (٢) ناپاکی؛ چەوتی؛ ناپاکێتی.
(٣) ساختە؛ هەڵخەڵەتاندن. (٤) شتێکی درۆ یا ساختە.

**falter** (fôl′tēr), *v.i.* (١) پێ داچوون؛ سانتەمەدان؛ پێ هەڵکەوتن؛ سەرسم دان. (٢) زمان گیران؛ لاڵەپەتێ کردن؛ دەم بەیەکدا هاتن.
(٣) گەڕانە دواوە (لەشکر)؛ بەیەکداهاتن؛ شکان؛ هەرەس هێنان؛ ڕووخان: *( The front ranks ~ed before the enemy.)*
*v.t.* بە ترسەوە ووتن؛ منگەمنگ کردن.
*n.* (١) پێ داچوون؛ سانتەمە؛ پێ هەڵکەوتن.
(٢) دەنگێکی بێ هێزو پچڕپچڕ.

**fame** (fām), *n.* ناوبانگ؛ ناوبانگی باش؛ ناوی باش؛ ناسراوی.
*v.t.* ناوبانگی باش بۆ دەرکردن؛ ناوی باش بڵاوکردنەوە.

**famed** (fāmd), *adj.* بەناوبانگ؛ بەناو؛ ناسراو؛ وا ناسراوە یا زانراوە.

**familial** (fə-mil′yəl), *adj.* خێزانی؛ تایبەت بە خێزان.

**familiar** (fə-mil′yēr), *adj.* (١) خێزانی.
(٢) (ا) نزیك (برادەر)؛ گیانی بە گیانی: *( a ~ friend)* .
(ب) زانراو؛ ناسراو: *( a ~ subject, theme, idea, etc.)* .
(٣) زیاد لە پێویست ڕووکرانەوە؛ تێکەڵاوی نابەجێ: *( He is too ~ with her.)*
(٤) ( **with** ~ )، شارەزا؛ بزان؛ ڕاهاتوو: *( to be ~ with a subject)* .
(٥) ئاسایی: *( Accidents are a ~ sight.)* .
(٦) ماڵی (گیانەوەر)؛ ماڵی کراو.
*n.* (١) برادەرێکی نزیك یا گیانی بە گیانی.
(٢) جنۆکەیەك یا شەیتانێك کە بەردەستی مرۆڤ دەکات.
(٣) [Obs.]، ئەندامی خێزانێك. (٤) بەردەستی قەشە یا پەرستگایەك.

**familiarity** (fə-mil´i-ar′ə-ti, fə-mil´yar′ə-ti), *n.* (١) نزیکی (هاوڕێیەتی)؛ تێکەڵاوی؛ ئاشنایەتی. (٢) ڕەووشتی تێکەڵاوی.
(٣) ڕووکرانەوە؛ شەرم شکانی نابەجێ.
(٤) (*pl.*) ووتەو کردارێك کە تەنها لەنێوان کەسانی زۆر تێکەڵاودا ڕوودەدات.
(٥) شارەزایی؛ زانین؛ ڕاهاتن لەگەڵ (باس).

**familiarize** (fə-mil′yə-rīz´), *v.t.* (١) پێناسین؛ ئاسایی کردن.
(٢) ڕاهێنان؛ فێربوون؛ پێ شارەزا بوون؛ هۆگر بوون: *( F~ yourself with the job.)*
-familiarization *(n.)*.

**family** (fam′ə-li, fam′li), *n.* (١) خێزان. (٢) خزم؛ خزم‌و کەس‌وکار.
(٣) خێڵ؛ هۆز؛ تیرە. (٤) (ا) بنەچە؛ بنەماڵە. (ب) بنەچەی خانەدان.
(٥) بابەت: *( a ~ of languages)* .
(٦) توخم (زیندەوەرناسی)
in a family way, سکپڕ.
in the family way, سکپڕ.

**family man,** (١) پیاوێکی خێزاندار؛ خاوەن خێزان.
(٢) پیاوێك کە سەر بە ماڵەوە بێت‌و ژیانی بۆ خێزانەکەی تەرخان کردبێت

**family name,** سەرناو؛ نازناو؛ بنەچە.

**family name,** ڕەگەزنامە؛ بنەچەنامە: تەخشەیەکە ناوی ئەندامانی خێزانێك‌و باوو باپیریانی تێدا تۆمار دەکرێت.

**famine** (fam′in), *n.* (١) برسێتی؛ برسێتییەکی زۆر.
(٢) قاتی؛ نەبوونی خواردەمەنی؛ نەبوونی.

**famish** (fam′ish), *v.t.* (١) برسی کردن؛ لاوازکردن لە برسێتیدا.
(٢) لە برسدا کوشتن.
*v.i.* (١) برسی بوون؛ زۆر برسی بوون. (٢) لە برسدا مردن.

**famous** (fā′məs), *adj.* (١) بەناوبانگ؛ ناودار؛ بەناو؛ ناسراو.
(٢) [Colloq.]، زۆر باش؛ نایاب.
(٣) [Archaic]، بەدناو؛ ناوخراپ؛ ناوزڕاو.
-famously *(adv.)*; famousness *(n.)*.

**famulus** (fam′yoo-ləs), *n.* شاگرد یا بەردەست (بەتایبەتی هی زانایەك یا جادووگەرێکی سەدەی ناوەڕاست).

**fan** (fan), *n.* (١) شەن (خەرمان). (٢) باوەشێن؛ پانکە.
(٣) پەروانەی پانکەی با (کە لە کێڵگەدا بەکاردەهێنرێت).
*v.t.* (١) باوەشێن کردن. (٢) گەشاندنەوە (ئاگر)؛ گەش کردنەوە (بە باوەشێن)
(٣) بزواندن؛ جووڵاندن (هەست)؛ هێنانەجۆش.

(٤) شەن کردن؛ جیاکردنەوەی دانەوێڵە لە کا.

**fan** (fan), *n.* [Colloq.], جگەرسۆز؛ حەزکەر؛ خۆشویست:
***( a baseball ~ ; a movie ~ ; a Charlie Chaplin ~ )***

**fanatic** (fə-nat′ik), *adj.* کوێرباوەڕ؛ مێشك تەسك؛ پەڕگر؛ کوێرانە شوێن کەوتوو.
***n.*** کەسێکی کوێرباوەڕ، مێشك تەسك، پەڕگر، یا کوێرانە شوێن کەوتوو.

**fanatical** (fə-nat′i-k′l), *adj.* مێشك تەسك؛ کوێرباوەڕ؛ یەك ڕا:
***( ~ beliefs ; ~ devotion to a cause)***

**fanaticism** (fə-nat′ə-siz′m), *n.* کوێرباوەڕی؛ مێشك تەسکی؛ کوێرانە شوێن کەوتن (بیروباوەڕ، ڕێباز)؛ هەستی بەتینی کوێرانە:
***( religious ~ )***

**fancier** (fan′si-ēr), *n.* (١) خەیال پلاو؛ کەسێکی دالفەچی.
(٢) کەسێك کە هەوەسی زۆرە لە لەیەکتر چاکردن و پەروەردەکردنی گیاندارو ڕووەك: ***( a dog ~ )***

**fanciful** (fan′si-fəl), *adj.* (١) خەیال پلاو؛ دالفەچی.
(٢) خەیالی؛ دوور لە ڕاستییەوە: ***( a ~ tale)*** .
(٣) سەیر؛ ناناسا: ***( ~ costumes)*** .

**fancy** (fan′si), *n.* (١) خەیال (٢) هەوەس؛ هەوەسێکی سەردەمی و حولحولییانە (٣) دالفە. (٤) حەز؛ حەزلێکردن؛ مەیل (بەتایبەتی ساتی).
(٥) ڕێ بەدییەکی ناسك لە هونەرو جل و بەرگدا.
***adj.*** (١) حولحول؛ حولحولییانە.
(٢) گرانبەها؛ زۆر گران: ***( a ~ price)*** .
(٣) جوان؛ ڕازاوە؛ کەشخە: ***( a ~ dress, jacket, etc.)*** .
(٤) نایاب؛ گران و باش: ***( a ~ shop; ~ groceries)*** .
***v.t.*** (١) هێنانە بەرچاوی خۆ. (٢) حەزلێکردن؛ خۆشویستن؛ دڵ لێچوون.
(٣) وادانان. (٤) چاکردنی گیاندار بۆ مەبەستێکی تایبەتی.

**fancy oneself,** حەز لە خۆ کردن؛ خۆ بە زل زانین؛ لەخۆبایی بوون.
**fancy ( that) ! ,** بڕوا دەکەیت (واتە بە شتێك یا ڕووداێکی سەیر؛ دە وەرە سەیر کە'.

**fancy-free** (fan′si-frē′), *adj.* (١) دڵی نەداوە بە کەس؛ دڵداری کەس نییە (٢) بێباك.

**fancy goods,** شتومەکی ڕازاندنەوە.
**fancy man,** گەواد؛ پیاوێك کە ئافرەتێکی سووك دەیژێنێت
**fancy woman,** (١) دۆست (٢) قەحبە؛ ئافرەتی سووك.

**fancy-work** (fan′si-wûrk′), *n.* نەخش و نیگار؛ نەخشاندن (جل و بەرگ).

**fan-fare** (fan′fâr′), *n.* تەپڵ و دەهۆڵ و زوڕنا لێدان؛ دەبدەبە؛ نواندنێکی پڕ هەراو زەنا

**fang** (faŋ), *n.* (١) کەڵبە (٢) چڕنووك؛ شقرە (فیل)؛ نووکە تیژەکەی شتێك.
(٣) ڕەگی ددان.

**fan mail,** نامەی پەسەندی و ستایش کردن کە کەسێکی بەناوبانگ بۆی دێت لەلایەن حەماوەرەوە

**fanny** (fan′i), *n.* [Slang]. قنگ؛ گووی قنگ؛ سمت

**fantasia** (fan-tā′zi-ə, fan-tä′zi-ə, fan′tə-zē′ə), *n.* ئاوازێکی مۆسیقای هەمەجۆرو هەمە شێواز

**fantast** (fan′tast), *n.* خەیال پەرست؛ دالفەچی؛ خەوپەرست

**fantastic** (fan-tas′tik), *adj.* (١) لە خەیاڵدا دروستکراو یا هەڵبەستراو؛ ناڕاستەقینە؛ دوور لە ڕاستییەوە: ***( ~ ideas)*** .
(٢) سەیر (ڕووخسار، ڕواڵەت)؛ ناناسا؛ سەرنج ڕاکێش:
***( a ~ hat; ~ shapes, dreams, fashions in dress).***
(٣) زۆر باش؛ نایاب: ***( a ~ place, person, food, dinner, school)*** .
***n.*** کەسێکی سەیر (لە ڕەووشت و جل و بەرگ و ڕووخساردا).
**-fantastical** *(adj.).*

**fantasize** (fan′tə-sīz′), *v.t.* هێنانە بەرچاوی خۆ؛ خەیال کردن.
***v.i.*** دالفەلێدان؛ چوونە ژێری

**fantasy** (fan′tə-si, fan′tə-zi), *n.* (١) خەیال.
(٢) دالفە؛ زڕەخەو؛ خەون.
(٣) هەوەس؛ هەوەسێك یا بیرێکی سەیرو ناناسا.
(٤) ئاوازێك، هەڵبەستێك، یا شانۆنامەیەکی ناناسا لە شێوازدا.

**far** (fär), *adj.* (١) دوور (جێگە، کات):
***( a ~ land; in the ~ future)***
(٢) درێژ؛ دوور (ماوە): ***( a ~ journey)*** .
(٣) ئەوپەڕ؛ ئەودیو؛ دوورترین: ***( the ~ side of the stage)*** .
(٤) زۆر جیاواز.
(٥) بەساڵداچوو؛ بەتەمەن.
***adv.*** (١) زۆر دوور (جێگە، کات، پلە، ماوە)؛ زۆر جیاواز.
(٢) زۆر؛ ئێجگار زۆر: ***( This book is ~ better than that.)***

**as far as,** تا ئەو ڕادەیەی کە؛ هەتا؛ ئەوەندەی؛ بەپێی.
**by far,** زۆر؛ ئێجگار؛ ئێجگار زۆر.
**far and away,** زۆر؛ ئێجگار؛ بێ گومان.
**far and near,** لە هەمووشوێنێك؛ لە دوورو نزیك.
**far and wide,** لە هەمووشوێنێك.
**far be it from me,** دوور لە منەوە (کردەوە، ڕەفتار)؛ چۆن من شتی وا دەکەم!.
**far gone,** پەرێشان.
**go far,** (١) زۆر بەش کردن؛ زوو تەواو نەبوون. (٢) زۆر لەوانە بوون.
(٣) زۆر پێشکەوتن؛ زۆر باش بە ئەنجام گەیشتن.
**in so far as,** تا ئەو ڕادەیەی کە؛ ئەوەندەی.
**so far,** (١) تا ئەو ڕادەیە. (٢) تا ئێستا؛ تا ئەم کاتە.
**so far, so good,** تا ئێستا هەمووشتێك باشە، واتە بە باشی دەڕوات.

**faraway** (fär′ə-wā′), *adj.* (١) دوور (جێگە، کات، پلە).
(٢) دالفاوی؛ خەیالاوی: ***( a ~ look)*** .

**farce** (färs), *n.* (١) شانۆگەرییەکی گاڵتەجار؛ شانۆنامەیەکی قۆشمە.
(٢) گاڵتەجاڕ (شت، کردەوە، ڕوودان)؛ گاڵتەبازاڕ؛ بێ مانا؛ شایستەی پێ پێکەنینە: ***( The elections were a ~ .)*** .
(٣) ئاواخنی باڵندەیەك (لە گۆشتی کوتراو و برنج و بەهارات).
***v.t.*** تێ ئاخن؛ پڕکردنەوە، یا بەهارات پێوەکردن (شانۆنامەیەك بە نوکتە)

**farcical** (fär′si-k′l), *adj.* بێ مانا؛ شایستەی پێ پێکەنینە؛ قۆشمە؛ گاڵتەبازاڕی.

**far cry,** زۆر دوور (پلە، چۆنێتی)؛ زۆر جیاواز؛ دوور.

**farcy** (fär′si), *n.* نەخۆشییەکی ئەسپ و ماینە.

**fare** (fâr), *v.i.* (١) [Poetic] ، چوون بۆ گەشت؛ ڕۆیشتن.
(٢) ڕوودان؛ ئەنجام دان یا بوون: ***( How did it ~ with him?)*** .
(٣) چۆن بوون؛ چۆنێتی (دۆخ): ***( He ~d well in his business.)*** .
(٤) نان خواردن؛ نان پێدران.
***n.*** (١) کرێی ڕێ (ئوتومبێل، فڕۆکە، شەمەندەفەر، عەرەبانە... هتد).
(٢) ڕێبوار؛ ڕێڕۆ؛ نەفەر (تەکسی، پاس، شەمەندەفەر... هتد).
(٣) خۆراك؛ خواردەمەنی. (٤) [Archaic]، دۆخ؛ بار.

**farewell** (fâr′wel′), *interj.* خواحافیز؛ خوات لەگەڵ؛ بە خوات دەسپێرم.
***n.*** خواحافیزی؛ ماڵئاوایی کردن؛ بەڕێ کردن.
***adj.*** هی خواحافیزی؛ تایبەتی بە بەڕێ کردن؛ دوا؛ دوایی: ***( a ~ gesture)*** .

**far-fetched** (fär′fecht′), *adj.* (١) ناچێتە مێشکەوە؛ ناسرووشتی؛ بڕوای پێ ناکرێت؛ نادرووست؛ لەوانە نییە؛ دوورە (لە باس یا ڕووداوەوە):
***( a ~ idea, comparison, plan, posibility, etc.)***
(٢) [Archaic]، لە دوورەوە هێنراوە.

**far-flung** (fär′fluŋ′), *adj.* (١) بڵاو؛ فراوان؛ پرش و بڵاو.
(٢) دوور؛ دوورەدەست (جێگە).

**farm** (färm), *n.* (١) (ا) باج یا کرێ کە لەسەر زەوی دەدرێت.
(ب) بە قۆنتەرات دانی کۆکردنەوەی ئەم باج یا کرێیە.

(ج) بەکرێدان یا گرتنی زەویوزار بە وەرزێر.
(٢) ناوچەیەکی بە کرێ دراو لەلایەن میرییەوە.
(٣) کێڵگە، باخ؛ بێستان؛ زەوی
(٤) شوێنی پەروەردەکردنی گیاندار *( a fish ~ )*
*v.t.* (١) چاندن، رواندن؛ کشتوکاڵ کردن
(٢) کۆکردنەوەی باج یا کرێ بە قۆنتەرات
(٣) ( out ~ ): بەکرێدانی زەوی یا کارگەیەك
(٤) پەروەردەکردنی منداڵ یا مرۆڤی بێکەس
*v.i.* وەرزێری کردن؛ کشتیاری کردن؛ لە کێڵگەدا کارکردن؛ سەرەوکاری کردنی کێڵگەیەك

**farmer** (fär′mēr), *n.* (١) جووتیەر؛ کشتیار؛ وەرزێر؛ کشتکار؛ (فەلاح).
(٢) کەسێك کە بە قۆنتەرات باج یا کرێ بۆ میری کۆدەکاتەوە

**farmerette** (fär′mēr-et′), *n.* ژنە وەرزێر؛ کشتیاری ژن.

**farm-house** (färm′hous′), *n.* خانوو یا ماڵی ناو کێڵگە.

**farming** (fär′miŋ), *adj.* کشتوکاڵی
*n.* (١) کشتوکاڵ. (٢) بەکرێدانی زەویوزار بۆ کشتوکاڵ.

**farmstead** (färm′sted′), *n.* خانووبەرە؛ خانوو زەویوزاری دەوروپشتی.

**far-reaching** (fär′rēch′iŋ), *adj.* مەودا فراوان؛ گەلێك شت دەگرێتەوە؛ کاردەکاتە سەر زۆر شت

**farrier** (far′i-ēr), *n.* (١) نالبەند؛ نالبەنگ.
(٢) [Obs.]، پزیشکی گیاندار (بەتایبەتی هی ئەسپ و ماین)

**farriery** (far′i-ēr-i), *n.* (١) نالبەندخانە
(٢) ئەسپ و ماین نال کردن.

**farrow** (far′ō), *n.* (١) سکێك بەچکە بەراز؛ سەرجەمی ئەو بەچکە بەرازانەی بە سکێك لەدایك دەبن (٢) [Obs.]؛ بەچکە بەراز.
*v.t. & v.i.* زاین (بەراز)

**farrow** (far′ō), *adj.* قسر (مانگا)

**farseeing** (fär′sē′iŋ), *adj.* (١) چاوتیژ
(٢) دووربین؛ خەمخۆری دواڕۆژ؛ وریا.

**far-sighted** (fär′sīt′id), *adj.* (١) چاوتیژ (٢) دووربین؛ وریا

**fart** (färt), *v.i. & v.t.* ترکەندن؛ بە لێ بەربوونەوە.
*n.* تر؛ بۆندار

**farther** (fär′*th*ēr), *adj.* (١) دوورتر (٢) زیاتر.
*adv.* (١) دوورتر (٢) تا رادەیەکی زیاتر. (٣) زیاد لەوەیش؛ سەرەڕای ئەوەیش.

**farthermost** (fär′*th*ēr-mōst′), *adj.* دوورترین

**farthest** (fär′*th*ist), *adj.* (١) دوورترین. (٢) درێژترین
*adv.* (١) دوورترین. (٢) زۆرترین؛ ئەوپەڕی؛ پەڕی ئەوپەڕ.

**farthing** (fär′*th*iŋ), *n.* (١) فلس؛ پوول؛ دراوێکی ئینگلیزی کەم بایەخە (٢) شتێکی کەم بایەخ یا هیچوپووچ.

**fasces** (fas′ēz), *n.pl.* چەپکە دارێك کە لە دەوری تەورێکەوە دەپێچرا بە مەرجێك دەمی تەورەکە بە دەرەوە بێت لە بەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆماوە هەڵدەگیرا بۆ نیشانەی دەسەڵات.

**fascinate** (fas′′n-āt′), *v.t.* (١) جادوولێکردن
(٢) سڕکردن بە تەماشاکردن:
*( Snakes are said to ~ small birds and animals.)*
(٣) دڵفڕاندن؛ هۆش لێ بڕین: *( She ~d him.)* .

**fascinating** (fas′′n-āt′iŋ), *adj.* دڵفڕێن؛ زۆر جوان؛ خۆش؛ سەیر.

**fascination** (fas′′n-ā′shən), *n.* (١) دڵفڕاندن
(٢) حەز، حەزلێکردن. (٣) دڵفڕێن؛ شتێکی دڵفڕێن

**fascism** (fash′iz′m), *n.* فاشیزم. فەلسەفەیەکی ڕامیاریو فەرمانڕەوایییە بریتییە لە دیکتاتۆرییەتی یەك حیزبو چەوساندنەوەی گەلو پێشێل کردنی مافەکانیو ڕەگەزپەرستیو جەنگاوەرێتی؛ فاشستییەت.

**fascist** (fash′ist), *n.* کەسێکی فاشستی.
*adj.* فاشستی

-fascistic *(adj.)*; fascistically *(adv.)*.

**fashion** (fash′ən), *n.* (١) شێوە (شت). (٢) جۆر؛ چەشن.
(٣) شێوە (کردنی کارێك، ڕەفتار)؛ شێواز؛ جۆر (کردن، ڕەفتار):
*( Do it in this ~ . ; He behaved in a strange ~ .)*
(٤) مۆدە؛ باو؛ نوێ باو؛ دەستووری بەرگ یا ڕەووشت... هتد.
(٥) شتێکی نوێ باو یا بە برەو.
*v.t.* (١) درووستکردن؛ داڕشتن؛ دانان؛ گەڵاڵەکردن
(٢) ( to ~ )، گونجاندن؛ شیاندن.
after ( or in) a fashion, تا ڕادەیەك؛ زۆر باش نا:
*( He can speak and write English- after a fashion.)*
after the fashion of, وەك (فڵان کەس یا شت).
in fashion, بە باو؛ نوێ باو؛ مۆدەیە؛ بە برەو.
out of fashion, باوی نەماوە؛ باوی نییە؛ مۆدەی نەماوە.

**fashionable** (fash′ən-ə-b'l), *adj.* بە باو؛ نوێ باو؛ مۆدەیە؛ مۆدە.
*n.* کەسێکی تەڕپۆش؛ کەسێك کە بەرگی بە باو لەبەر دەکات.
-fashionably *(adv.)*.

**fast** (fast, fäst), *adj.* (١) چەسپاو؛ چەسپیو؛ نەبزۆك؛ جێگیر؛ قایم.
(٢) دڵسۆز؛ نەگۆڕ: *( ~ friends)* .
(٣) باش؛ تەواو. *( a ~ sleep)* .
(٤) ناچێتەوە (ڕەنگ)؛ نەگۆڕ.
(٥) خێرا؛ تیژڕەو؛ تیژ؛ بەگوڕ: *( a ~ train)*
(٦) خێرا؛ ڕێگەی خێرا ڕۆیشتن ئەدات: *( a ~ highway)* .
(٧) کورت؛ پەلە؛ خێرا (سەردان): *( a ~ visit)* .
(٨) لە پێش (کاتژمێر)؛ خێرا (کاتژمێر): *( a ~ watch)* .
(٩) (أ) کەیف پەرست. (ب) سووك (ئافرەت).
(١٠) خێرا (کامێرا).
*adv.* (١) بە قایم؛ بە چەسپاوی.
(٢) بە تەواوی؛ بە باشی: *( The child was ~ asleep.)* .
(٣) خێرا؛ بە خێرایی؛ تیژ؛ گورج؛ خێرا (کارکردن).
(٤) بە بێباکانە؛ بێباکانە.
play fast and loose, بێباکانە ڕەفتار نواندن.

**fast** (fast, fäst), *v.i.* ڕۆژووگرتن.
*n.* (١) ڕۆژووگرتن. (٢) ماوەی ڕۆژووگرتن.
break one's fast, ڕۆژوو شکاندن.

**fasten** (fas′′n, fäs′′n), *v.t.* (١) بەستن؛ پێوەبەستن؛ بەستنەوە؛ توندکردنەوە؛ قایم کردن؛ شەتەکدان.
(٢) ( on ~ )، ئاراستەکردن (سەرنج، چاو).
(٣) سەپاندن بە سەردا؛ پێوەنان (تاوان).
*v.i.* (١) پێوەبەستران. (٢) پێوەلکان؛ یەکگرتن.
-fastener *(n.)*.

**fastening** (fas′′n-iŋ, fäs′′n-iŋ), *n.* (١) قایم کردن؛ توندکردن؛ بەستنەوە. (٢) شتی قایمکەر (قفڵ، زنجیر، قولاپ).

**fastidious** (fas-tid′i-əs), *adj.* (١) بە هیچ ڕازی نەبوو؛ بە گلەیی؛ زۆر ڕەخنەگر: *( ~ about one's clothes, food, etc.)* .
(٢) لە ئەندازە بەدەر پاكوتەمیزو ڕێكوپێك (مرۆڤ)؛ بە قێزوبێز:
*( a ~ person)*

**fastness** (fast′nis, fäst′nis), *n.* (١) خێرایی؛ گورجی.
(٢) قایمی؛ بێ مەترسی؛ پارێزراو. (٣) مەڵبەند؛ لانە؛ قەڵا.

**fat** (fat), *adj.* (١) چەور (گۆشت، خواردەمەنی). (٢) قەڵەو؛ گۆشتن.
(٣) ئەستوور؛ پان. (٤) بە بەرەکەت (زەوی).
(٥) بەسوود؛ سوودبەخش؛ باش: *( a ~ job)* .
(٦) دەوڵەمەند؛ خۆش گوزەران.
(٧) زەبەنە؛ زۆروزەبەنە؛ مشە؛ فرە.
(٨) کەر؛ بێ مێشك: *( a ~ head)* .
*n.* (١) بەز؛ پیو؛ لەبە. (٢) ڕۆن؛ چەوری (چێشت لێنان).

(٣) قەڵەوی؛ گۆشتنی.
(٤) چەورترین بەشی شتێك.
*v.t.* قەڵەوکردن
*v.i.* قەڵەوبوون
**a fat chance,** [Slang], لەوانە نییە؛ بۆی نییە ببێت.
**a fat lot,** [Slang], هیچ؛ کەم؛ زۆر کەم *( a fat lot you care!)* .
**chew the fat,** [Slang], دەمەتەقێ کردن؛ پێکەوە دووان.
**kill the fatted calf,** دابەستە یا مەڕ بۆ سەربڕین؛
بەخێرهاتنەوەیەکی زۆر گەرم کردن.
**live on the fat of the land,** لە خۆش گوزەرانیدا بوون.
**the fat is in the fire,** ئەوەی ڕوویداوە ناگەڕێتەوە؛
ئەوەی ڕوویداوە دەبێت بە هۆی هەراوزەنایەکی زۆر.
**fatal** (fā′t'l), *adj.* (١) چارەنووسی؛ هەر دەبێ ببێ.
(٢) بەدووم؛ گرنگ (کات، ڕووداو): *( The ~ day arrived.)* .
(٣) بکوژ؛ کوشندە: *( a ~ accident; a ~ blow)* .
(٤) کارەساتی وێرانکەر.
**fatalism** (fā′t'l-iz'm), *n.* بڕوابوون بە چارەنووس؛ ئەم فەلسەفەیە.
**fatalist** (fā′t'l-ist), *n.* کەسێك کە بڕوای بە چارەنووس هەبێت.
**fatalistic** (fā't'l-is′tik), *adj.* چارەنووسی؛ بڕوا بە چارەنووس بوو.
**-fatalistically** *(adv.)*.
**fatality** (fə-tal′ə-ti, fā-tal′ə-ti), *n.* (١) کاری چارەنووس.
(٢) کارەساتی کوشندە
(٣) مردن (بە دەرد، لە جەنگدا، یا بە ڕوودانێکی ڕێکەوت):
*( ~ies from automobile accidents)*
**fatally** (fā′t'l-i), *adv.* (١) هەر دەبێ ببێت؛ چارەنووسە.
(٢) کوشندانە؛ بکوژانە: *( ~ wounded)* .
**fate** (fāt), *n.* (١) چارەنووس؛ شانس؛ خواکرد.
(٢) ئەنجام؛ دوا ئەنجام. (٣) مردن؛ مەرگ.
**fated** (fāt′id), *adj.* (١) وا نووسراوە؛ چارەنووس وەهایە؛ خواکردەیە.
(٢) وێران بوون یا ژێرکەوتنی لە چارە نووسراوە.
**fateful** (fāt′fəl), *adj.* (١) چارەنووسی. (٢) گرنگ؛ بەلایەکداخەر.
(٣) کوشندە؛ بکوژ
**fat-head** (fat′hed'), *n.* کەسێکی کەرو بێ مێشك.
**fat-headed** (fat′hed'id), *adj.* کەر؛ بێ مێشك.
**father** (fä′*th*ēr), *n.* (١) باوك؛ باب (٢) پارێزەر.
(٣) [F-]، خودا؛ خوا؛ یەزدان. (٤) *(pl.)*، باووباپیر.
(٥) داهێنەر؛ دۆزەرەوە؛ دانەر؛ دروستکەر:
*( the ~ of the atomic bomb)*
(٦) کەسێکی بەڕێز (بەهۆی تەمەن یا پلەوە).
(٧) نوێنەرێکی پەرلەمانی ڕۆمای کۆن.
(٨) *(pl.)*، سەرۆکانی شار؛ پێشڕەوو کەلەپیاوانی شار: *( the city ~s)* .
(٩) [F-]، نووسەرێکی خاچ پەرستی کۆن.
(١٠) (ا) قەشەیەکی کاسۆلیکی. (ب) نازناوی قەشەیەکی وەها.
*v.t.* (١) بوون (منداڵ)؛ بوون بە باوکی: *( He ~ed their children.)* .
(٢) پاراستن وەك باوك. (٣) داهێنان؛ دۆزینەوە؛ دانان؛ درووستکردن.
**fatherhood** (fä′*th*ēr-hood'), *n.* باوکێتی؛ باوکی؛ باوکایەتی.
**father-in-law** (fä′*th*ēr-'n-lô'), *n.* خەزوور
**fatherland** (fä′*th*ēr-land'), *n.* نیشتمان؛ نیشتمانی باووباپیر.
**fatherless** (fä′*th*ēr-lis), *adj.* (١) هەتیو؛ بێ باوك.
(٢) باوکی خۆ نەناس.
**fatherly** (fä′*th*ēr-li), *adj.* (١) باوکانە؛ باوکی: *( ~ duties)* .
(٢) باوکانە؛ تایبەتی بە باوك؛ بە ڕەحم.
*adv.* [Archaic], شێوەیەکی باوکانە؛ بە باوکانە.
**-fatherliness** *(n.)*.
**fathom** (fa*th*′əm), *n.* پێوانەیەکی شەش پێییە (بۆ پێوانی قووڵایی
ئاوو درێژی پەتو زنجیر).
*v.t.* (١) پێوان (قووڵایی)؛ پێواندن
(٢) باش تێگەیشتن؛ گەیشتنە بنج‌وبناوان؛ ڕێ پێ بردن.
**fathomless** (fa*th*′əm-lis), *adj.* (١) بێ بن؛ زۆر قووڵ؛
ئەوەندە قووڵە بنی نییەو ناپێورێ. (٢) تێگەیشتنی بۆ نییە؛ کەس تێی
ناگات.
**fatigue** (fə-tēg′), *n.* (١) ماندوێتی (لەش و مێشك)؛ لە پەل‌وپۆ کەوتن؛
هێز لێ بڕان. (٢) هۆی ماندوێتی؛ ئەرکی گران.
(٣) ئیش‌وکاری سەرباز جگە لە مەشق.
(٤) *(pl.)*، جلی کاری سەرباز جگە لە مەشق.
*v.t.* (١) ماندووکردن؛ هێز لێ بڕاندن؛ لە پەل‌وپۆ خستن.
(٢) لاوازکردن (بە بەکارهێنانی سەروەر).
**fatigue clothes,** جلی ئیش‌وکاری سەرباز جگە لە مەشق.
**fatigue duty,** ئیش‌وکاری سەرباز جگە لە مەشق.
**fatling** (fat′liŋ), *n.* بەچکە دابەستە (بەرخ، کار، گوێرەکە، بەچکە بەران).
**fatso** (fat′sō), *n.* [Slang], کەسێکی قەڵەو.
**fatten** (fat′'n), *v.t.* (١) قەڵەوکردنەوە؛ قەڵەوکردن؛ دابەستن:
*( to ~ animals)*
(٢) پەین تێکردنی زەوی‌و بەهێزکردنی.
(٣) گەورەکردن؛ هەڵئاوسان؛ دەوڵەمەندکردن:
*( He ~ed his purse by robbing the poor.)*
*v.i.* قەڵەوبوون.
**fattiness** (fat′i-nis), *n.* (١) قەڵەوی. (٢) چەوری؛ چەورایی.
**fattish** (fat′ish), *adj.* نەختێك قەڵەو.
**fatty** (fat′i), *adj.* (١) چەور. (٢) لە شتی چەور درووستکراو.
*n.* [Colloq.], کەسێکی قەڵەو (نازناو).
**fatuitous** (fə-tū′ə-təs, fə-too′ə-təs), *adj.* کەر؛ بێ مێشك.
**fatuity** (fə-tū′ə-ti, fə-too′ə-ti), *n.* کەری؛ کەرێتی؛ بێ مێشکی.
**fatuous** (fach′ōō-əs), *adj.* کەر؛ بێ مێشك؛ نەزان.
**faucet** (fô′sit), *n.* بەلووعە.
**fault** (fôlt), *n.* (١) کەم‌وکووڕی؛ ناتەواوی؛ گەرد؛ خەوش:
*( She loves him in spite of his ~s .)*
(٢) سووچ؛ خەتا: *( It is your own ~ if you fail .)* .
(٣) (ا) هەڵە. (ب) خراپە؛ بەدی.
(٤) قڵیشی گەورەی زەمین کە دەبێتە هۆی بوومەلەرزە (زەمیناسی).
(٥) (ا) بە هەڵە لێدانی سێرڤ (یاری تەنس).
(ب) تۆپێکی سێرڤی بە هەڵە لێدراو.
(٦) وون کردنی بۆنی نێچیرو نەدۆزینەوەی (سەگی ڕاو).
*v.t.* (١) [Rare]، لۆمەکردن؛ هێنان بەسەردا.
(٢) درزکردنە زەوییەوە (زەمیناسی).
*v.i.* (١) [Archaic]، هەڵەکردن (٢) درزتێبوونە زەوی (زەمیناسی).
**at fault,** (١) وون کردنی بۆنی نێچیرو نەدۆزینەوەی (سەگی ڕاو).
(٢) سەر لێ شێواندن. (٣) سووچدار؛ گوناهبار؛ خەتابار؛ هەڵەکەر؛
شایستەی لۆمەکردنە.
**find fault,** ڕەخنەگرتن؛ کەم‌وکووڕی دۆزینەوە؛ سکاڵاکردن.
**find fault with,** ڕەخنەلێگرتن؛ بە دڵ نەبوون؛ کەم‌وکووڕی تێدا
دۆزینەوە.
**in fault,** سووچدار؛ گوناهبار؛ خەتابار.
**to a fault,** ئێجگار؛ زۆر؛ لە ڕادە بەدەر.
**fault-finder** (fôlt′fīn'dēr), *n.* سکاڵاکەر؛ هەمیشە ڕەخنەگر؛
کەسێکی خۆش گلەیی.
**fault-finding** (fôlt′fīn'diŋ), *n.* ڕەخنەگرتن؛ کەم‌وکووڕی دۆزینەوە.
*adj.* ڕەخنەگر؛ کەم‌وکووڕی دۆزەرەوە؛ خۆش گلەیی.
**faultless** (fôlt′lis), *adj.* بێگەرد؛ بێ کەم‌وکووڕی؛ تەواو؛ باش.
**faulty** (fôl′ti), *adj.* (١) ناتەواو؛ خراپ؛ کەم‌وکووڕیدار.
(٢) [Obs.]، گوناهبار؛ خەتابار.

**faun** (fôn), *n.* نیمچە خودایەکی لادێی ڕۆمانەکانی کۆنە لە ناوقەد بەرەو ژووری وەك ئادەمیزادو گوێچکەو شاخ‌و کلك‌و لاقی وەك بزن (ئەفسانەی ڕۆمای کۆن)

**fauna** (fô′nə), *n.* (١) گیاندارانی ناوچەیەك یا کاتێکی تایبەتی:
*( the ~ and flora of North America)*
(٢) باسێك یا نووسراوێك دەربارەی ئەم گیاندارانە.

**faux pas** (fō′ pä′), *n.* هەڵە (بەتایبەتی لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیدا)؛ ووتەیەك یا کردەوەیەکی نابەجێ

**favor** (fā′vẽr), *n.* (١) پەسەندی؛ پەسەندکردن؛ خوایشت؛ پاڵپشت کردن؛ خوایشت ویستن:
*[ to win a person's ~ ;*
*to look at a plan ( a person) with ~ ]*
(٢) لایەنگری.
(٣) چاکە؛ چاکانە؛ پیاوەتی؛ خاترانە؛ یارمەتی:
*( He did me a ~ .; Could you do me a ~ ?)*
(٤) (*pl.*)، ڕازی بوونی ئافرەتێك بۆ جووت بوون.
(٥) دیاری (دڵداری، خۆشەویستی).
(٦) نامە؛ ڕاگەیاندننامە؛ یادنامە: *( Your ~ has been received.)* .
*v.t.* (١) پەسەندکردن؛ ڕا لێ بوون؛ بەلاوە باش بوون.
(٢) لایەنگری کردن؛ خۆشویستن؛ خوایشت ویستن.
(٣) ئاسان کردن؛ یارمەتیدان. (٤) چاکە لەگەڵ کردن؛ پیاوەتی لەگەڵ کردن.
(٥) لێچوون؛ لێکردن؛ وەك وابوون: *( The baby ~s its mother.)* .
(٦) ئاگا لێ بوون (لەبەر لاوازی)؛ بە ئاسانی لەگەڵدا جووڵانەوە یا بەکارهێنان؛ حەواندنەوەو کەم بەکارهێنان: *( He ~ed his weak arm, leg, etc.)* .
**in favor,** خوایشت ویستراو؛ خۆش ویستراو؛ ویستراو:
*( He is in favor with his boss these days.)*
**in favor of,** (١) پەسەندکردن؛ لایەنگری کردن؛ ڕا لەسەر بوون:
*( He is in favor of women's rights.)*
(٢) لەبەر؛ لەبەر خاتری؛ بۆ سوودی کەسێك یا شتێکی تر:
*( He resigned in favor of his rival.)*
(٣) دەدرێت بە (چەك، پارە).
**in one's favor,** چاکەی ئەو کەسەی تێدایە؛ لە سوودی ئەو کەسەدایە:
*( The exchange rate is not in our favor.)*
**out of favor,** خوایشت نەویستراو؛ خۆش نەویستراو؛ نەویستراو:
*( He is out of favor with his teacher.)*
**return a favor,** چاکەدانەوە؛ پیاوەتی دانەوە؛ چاکە لەگەڵدا کردنەوە.

**favorable** (fā′vẽr-ə-b'l), *adj.* (١) بهات؛ هات؛ باش:
*( ~ conditions; ~ winds)*
(٢) پەسەند؛ باش *( a ~ report)* .
**-favorably** *(adv.).*

**favored** (fā′vẽrd), *adj.* (١) (ا) خوایشت ویستراو؛ ویستراو.
(ب) لێهاتوو (٢) نمایشێکی تایبەتی هەیە: *( ill- ~ )* .

**favorite** (fā′vẽr-it, fāv′rit), *n.* (١) پەسەندترین کەس یا شت؛ خۆشەویست ترین‌و بەلاوە باشترین کەس یا شت:
*( This book is a great ~ of mine.)*
(٢) کەسێك کە پیاوێکی بەدەسەڵات زۆر خاتری دەگرێت‌و چاکەی لەگەڵ دەکات.
(٣) بەشداری ملەملێیەك کە چاوەڕوانی بردنەوەی لێ دەکرێت (ئەسپ، مرۆڤ).
*adj.* پەسەندترین؛ بەلاوە باشترین؛ خۆشەویست ترین:
*( My ~ food, place, book, movie, teacher, etc.)*

**favorite son,** (١) ڕۆڵە؛ کەسێك کە لە ناوچەکەی خۆیدا زۆر ڕێزی دەگیرێت لەبەر کردەوەکانی. (٢) کەسێك کە دەیەوێت خۆی هەڵبژێرێت بۆ پلەیەکی بەرز (وەك سەرەك کۆمار) وە لە ناوچەکەی خۆیدا جەماوەر لەوانەی ناوچەکانی تریان لە لا باشترە کە دەیانەوێت خۆیان هەڵبژێرن.

**favoritism** (fā′vẽr-it-iz'm, fāv′rit-iz'm), *n.* جیاکاری؛ خاترو خوایشت؛ خاترگرتن.

**favus** (fā′vəs), *n.* کەچەڵی

**fawn** (fôn), *v.i.* (١) کلکەلەقێ بۆکردن (سەگ).
(٢) مەرایی کردن؛ بە دەوروقنگدا هاتن:
*( The courtiers ~ on the king.)*

**fawn** (fôn), *n.* (١) بەچکە ئاسك (کە تەمەنی لە ساڵێك کەمتر بێت).
(٢) قاوەیی‌یەکی کاڵ.

**faze** (fāz), *v.t.* [Colloq.], پەستکردن؛ شڵەژاندن.

**fealty** (fē′əl-ti), *n.* (١) دڵسۆزی‌و ئەرکی سەرشانی وەرزێر بەرامبەر بە دەرەبەگ. (٢) [Archaic or Poetic]، دڵسۆزی.

**fear** (fêr), *n.* (١) ترس؛ ترس‌و لەرز؛ باك. (٢) سام.
(٣) مەترسی.
*v.t.* (١) لێ ترسان. (٢) سام لێکردن؛ سڵ لێکردن.
(٣) مەترسی لێکردن؛ مەترسی لێ بوون؛ گومان لێکردن.
*v.i.* (١) ترسان. (٢) مەترسی لێ بوون؛ گومان لێ بوون.
**for fear of,** نەکو؛ نەك؛ لە ترسی ئەوەی.

**fearful** (fêr′fəl), *adj.* (١) ترسناك؛ سامناك.
(٢) ترساو؛ ترسدار.
(٣) پڕ ترس؛ بە ترسەوە: *( a ~ look)* .
(٤) [Colloq.]، زۆر بەدو ناپەسەند: *( a ~ liar)* .
**-fearfully** *(adv.).*

**fearless** (fêr′lis), *adj.* ئازا؛ بێ ترس؛ بەجەرگ؛ چاونەترس.

**fearsome** (fêr′səm), *adj.* (١) ترسناك؛ سامناك؛ بە سام.
(٢) ترسنۆك.

**feasibility** (fē′zə-bil′ə-ti), *n.* بۆ هەبوون؛ دەست دان؛ شیان؛ گونجان؛ ڕێ تێ چوون.

**feasible** (fē′zə-b'l), *adj.* دەکرێت؛ دەشێت؛ دەگونجێت؛ دەتوانرێت بکرێت؛ کردەنی.

**feast** (fēst), *n.* (١) جەژن. (٢) ژەمێك خواردنی خۆش‌و زەبەنە.
(٣) شتێکی خۆش‌و زەبەنە
*v.i.* جەژن کردن؛ خواردەمەنی‌یەکی خۆش‌و زۆرو هەمەچەشنە؛ خواردن.
*v.t.* (١) بانگ کردن بۆ ژەمێك خواردنی خۆش‌و زەبەنە.
(٢) مژڵێدان (مەجاز)؛ خۆشی لێ بینین؛ خۆشی پێدان:
*( He ~ed his eyes on her.)*

**feat** (fēt), *n.* کارێکی چالاکانە؛ شاکار؛ کردارێکی ئازایانە.

**feat** (fēt), *adj.* [Archaic], (١) شیاو؛ باش؛ گونجاو.
(٢) کارامە؛ لێهاتوو.

**feather** (feth′ẽr), *n.* (١) پەڕ؛ پەڕی باڵندە. (٢) پەڕی تیر.
(٣) (ا) شتێکی سووك. (ب) چوکڵە (مەکینە)؛ نووکە.
(ج) شەپۆلی دوای دووربینی سەر کەشتی ژێرئاو.
(د) تووکی کلك‌و لاقی هەندێ سەگ.
(٤) (*pl.*) (ا) هەموو پەڕی باڵندەیەك. (ب) جل‌وبەرگ.
(٥) توخم؛ چەشن؛ جۆر: *( birds of a ~ )* .
(٦) خووڕەووشت؛ سرووشتی مرۆڤ؛ هەوەس؛ تاقەت.
*v.t.* (١) پەڕ لێدان (تیر)؛ پەڕ پێوەکردن. (٢) ڕازاندنەوە بە پەڕ.
(٣) پێکەوەبەستن بە چوکڵە یا نووکە. (٤) وەرگەڕانی دەمی سەوڵی بەلەم بۆ باری ئاسۆیی (لە بەینی سەوڵ لێداندا) بۆ بەرهەڵستی نەکردنی ئاوەکە.
*v.i.* (١) پەڕ دەرکردن. (٢) وەك پەڕ بزوان یا درێژبوونەوە.
(٣) لە پەڕ چوون؛ لە پەڕ کردن؛ وەك پەڕ وابوون.
(٤) ڕاستکردنەوەی دەمی سەوڵی بەلەم بۆ باری ئاسۆیی.
**a feather in one's cap,** کارێك یا دەسکەوتنێك کە جێگەی شانازی بێت بۆ کەسێك.
**birds of a feather,** یەك توخم (مرۆڤ)؛ مرۆڤی هەمان خووڕەووشت.
**feather one's nest,** دەوڵەمەندبوون بە هەل بۆ هەڵکەوتن یا هەل پەرستن (بەتایبەتی بەکارهێنانی سەرمایەی کەسێکی تر).
**in fine ( or high or good ) feather,** بە کەیف؛ کەیف قنج؛ تەندرووست.

**show the white feather,** ترس پیشاندان؛ ترسان.

**featherbrain** (feth'ēr-brān'), *n.* کەسێکی بێ مێشکو بێ ئاگاو کەر

**feathered** (feth'ērd), *adj.* (١) پەردار؛ پەڕاوی؛ بە پەڕ داپۆشراو
(٢) خێرا؛ تیژڕەو؛ باڵدار.

**featheredge** (feth'ēr-ej'), *n.* قەراغ یا دەمێکی تەنکو تیژو ناسك (ئامێر، تەختە)

**featherhead** (feth'ēr-hed'), *n.* = **featherbrain.**

**featherweight** (feth'ēr-wāt'), *n.* (١) کەسێك یا شتێکی سووك یا بچووك (٢) کەسێك یا شتێکی بێ بایەخ یا کەم نرخ.
(٣) زۆرانباز یا بۆکسبازێك کە سەنگی لەنێوان ١١٩–١٢٦ پاوەندا بێت.

*adj.* (١) تایبەتی بە کەس یا شتی سووك یا بێ بایەخ.
(٢) سووك؛ بێ بایەخ؛ هیچ‌وپووچ

**feathery** (feth'ēr-i), *adj.* (١) پەردار؛ پەڕاوی؛ بە پەڕ داپۆشراو.
(٢) سووكو نەرم؛ لە پەڕ چوو.

**featly** (fēt'li), *adv.* (١) بە جوانی؛ بە ڕێك‌وپێکی
(٢) بە کارامەیی؛ کارامانە؛ بە باشی

*adj.* [Archaic]. جوان‌و ڕێك‌وپێك؛ شۆخ‌وشەنگ.

**feature** (fē'chēr), *n.* (١) شێوە؛ ڕوخسار
(٢) (أ) (*pl.*)، دەم‌وچاو؛ ڕەنگ‌و ڕوخسار؛ ڕەنگ‌و ڕوو.
(ب) ئەندامێك لە ئەندامەکانی دەم‌وچاو (وەك دەم، چاو، لووت... هتد).
(٣) نیشانە؛ نیشانەی جیاکەرەوە؛ نیشانەی تایبەتی:
*( The island's main ~ was its beauty.)*
(٤) شتێکی بە گەورەیی یا بە ئاشکرا پیشاندراو لە شوێنێکدا بۆ سەرنج ڕاکێشان (٥) ووتار یا چیرۆکێکی تایبەتی‌و سەرنج بۆ ڕاکێشراو لە ڕۆژنامە یا گۆڤارێکدا (٦) فیلمی سینەما؛ فیلمێکی درێژ.

*v.t.* (١) پیشاندان؛ دەرخستن. (٢) بە گەورەیی دەرخستن؛ سەرنج بۆ ڕاکێشان.
(٣) ڕووخسار پیشاندان؛ نەخشەکێشان‌و ڕووخسار ڕوونکردنەوە.
(٤) نیشانەی سەرنج ڕاکێشەر بوون (٥) [Slang]، هێنانە پێش چاوی خۆ.

**featured** (fē'chērd), *adj.* (١) ڕووخسارێکی تایبەتی هەبوون
*( broad- ~ )*
(٢) شێوەگرتوو؛ خۆگرتوو.
(٣) بە ئاشکرایی‌و تایبەتی پیشاندراو یا دەرخراو

**feature-length** (fē'chēr-leŋth'), *adj.* درێژو تەواو (فیلم، ووتاری ناو گۆڤار): *( a ~ film or article)*

**featureless** (fē'chēr-lis), *adj.* بێ نیشانەی تایبەتی یا جیاکەرەوە

**February** (feb'roo-er'i), *n.* مانگی ڕەشەمێ

**fecal** (fē'kəl), *adj. Also* faecal. تایبەتی بە گوو یا پیسایی؛ هی پیسایی

**feces** (fē'sēz), *n.pl. Also* faeces. (١) گوو؛ پیسایی (٢) خڵتە

**feckless** (fek'lis), *adj.* (١) بێ هێز؛ لاواز؛ بێ ووزە؛ سست؛ بێکارە؛ بێ ئەنجام (٢) بێباك؛ گوێ نەدەر؛ بێ هەست

**fecund** (fē'kənd, fek'ənd), *adj.* بەبەر؛ بەبرشت؛ بەپیت؛ منداڵی زۆر دەبێت

**fecundate** (fē'kən-dāt', fek'ən-dāt'), *v.t.* (١) بەپیت کردن؛ بەبرشت کردن (٢) سکپڕکردن؛ ئاووس کردن؛ لێ پەڕاندن؛ چاکردن (ڕووەك، گیاندار

**fecundity** (fi-kun'də-ti), *n.* بەپیتی؛ بەبرشتی؛ بەر زۆر گرتن؛ منداڵ زۆر بوون؛ سك زوو زوو پڕبوون.

**fed** (fed), *past tense and past participle of* **feed.**

**fed up,** [Slang]. وەڕس بوون؛ بێزار بوون؛ تاقەت لێ چوون
*( to be fed up with a person, a job, a place, etc.)*

**federal** (fed'ēr-əl, fed'rəl), *adj.* (١) فیدراڵی (أ) تایبەتی بە یەکگرتنی چەند ناوچەیەك لەژێر یەك ئاڵادا (ب) تایبەتی بە فەرمانڕەوایییەکی ناوەندی کە دەسەڵاتی هەبێت بەسەر فەرمانڕەوایی ناوچەکاندا.
(٢) [F-]، تایبەتی بە فەرمانڕەوایی ناوەندی ئەمەریکا.
(٣) [F-]، تایبەتی بە، یا پاڵپشتیکەری، یەکێتی ئەمەریکا دژی جیابوونەوە (لە شەڕی براکوژی ئەمەریکادا ١٨٦١–١٨٦٥).

*n.*[F-], سەرباز یا پاڵپشتیکەری یەکێتی ئەمەریکا دژی جیابوونەوە (لە شەڕی براکوژی ئەمەریکادا).

**federalism** (fed'ēr-əl-iz'm, fed'rəl-iz'm), *n.* (١) فیدرالیزم: ڕێگاو بیروڕاو شێوەو دەستووری فەرمانڕەوایی فیدراڵی.
(٢) [F-]، پارەوو بیروڕای حیزبی فیدراڵی ئەمەریکا.

**federalist** (fed'ēr-əl-ist, fed'rəl-ist), *n.* (١) لایەنگری شێوەی فەرمانڕەوایی فیدراڵیزم (٢) [F-]، لایەنگر یا ئەندامی حیزبی فیدراڵی ئەمەریکا.

*adj.* (١) تایبەتی بە لایەنگری کردنی فیدراڵیزم.
(٢) تایبەتی بە لایەنگری کردنی حیزبی فیدراڵی ئەمەریکا.

**federalize** (fed'ēr-əl-īz', fed'rəl-īz'), *v.t.* کردن بە فیدراڵی؛ یەك پێگرتنی چەند ناوچەیەك لەژێر ئاڵای فەرمانڕەوایییەکی ناوەندی گشتیدا.

-**federalization** *(n.).*

**federate** (fed'ēr-it), *adj.* یەکگرتوو لەژێر فەرمانڕەوایی فیدراڵیدا.

*v.t. & v.i.* یەکگرتن لەژێر فەرمانڕەوایی فیدراڵیدا.

**federation** (fed'ə-rā'shən), *n.* (١) یەکگرتن؛ بوون بە فیدراڵی؛ بوون بە یەك. (٢) یەکێتی.

**fee** (fē), *n.* (١) زەوی‌وزارێك کە وەرزێرێك لە دەرەبەگێکی وەردەگرێت بە ئەمانەت بۆ چاندنی (بەرامبەر بە هەندێ ئەرك).
(٢) وەرگرتنی ئەم جۆرە زەوی‌وزارە.
(٣) مز؛ کرێ. (٤) بەخشیش.

**hold in fee,** خاوەن بوونی زەوی‌وزار؛ خاوەنێتی کردن یا هەبوونی زەوی‌وزار.

**feeble** (fē'b'l), *adj.* (١) لاواز؛ بێ هێز؛ بێ ووزە: *( a ~ old man)* .
(٢) کز؛ بێ تین: *( a ~ light; a ~ attempt)* .
(٣) ناسك؛ لەرزۆك: *( a ~ barrier)* .

-**feebly** *(adv.).*

**feeble-minded** (fē'b'l-mīn'did), *adj.* مێشك سووك؛ بێ مێشك؛ خلەفاو.

**feed** (fēd), *v.t.* (١) خواردن پێدان؛ دان پێدان؛ دەرخوارد دان.
(٢) پێدان (شتێکی پێویست)؛ بەخێوکردن. (٣) هاندان.
(٤) دان دان (مەکینە، ئاگر، ڕۆچا... هتد).
(٥) خۆشی پێدان؛ دڵخۆش کردن.

*v.i.* خواردەمەنی خواردن (گیاندار)؛ خواردن.

*n.* (١) ئالیك؛ خواردەمەنی گیاندار؛ دان (باڵندە)؛ ئالف.
(٢) یەك ئالیك؛ ژەمێك خواردەمەنی گیاندار
(٣) دانێك کە دەدرێت بە مەکینەیەك.
(٤) دان دانی مەکینەیەك. (٥) بەشی داندەر (مەکینە).
(٦) [Colloq.]، ژەم؛ ژەمە خواردن.

**feed on ( or upon ),** (١) خواردن؛ پێ ژیان؛ لەسەر ژیان.
(٢) خۆشی لێ وەرگرتن؛ پێ ژیان.

**feedback** (fēd'bak'), *n.* (١) دانەوەی ووزە یا هێز (مەکینە).
(٢) وەڵام دانەوە بە ووتە یا کردار؛ هەست پیشاندان بەرامبەر کردار یا ڕەفتارێك:
*( A teacher needs ~ from his students to find out how they like his teaching method.)*

**feeder** (fēd'ēr), *n.* (١) دان پێدەر (مەکینە).
(٢) جۆگە (بەتایبەتی کە بڕژێتە ناو ڕووبارێکەوە)؛ لقە ڕووبار.
(٣) گەیەنەرو دابەشکەری ئەلەکتریك. (٤) شووشەی شیری منداڵ؛ مەمە.

**feel** (fēl), *v.t.* (١) دەست تێوەدان؛ دەست لێدان. (٢) هەستپێکردن.
(٣) هەست جووڵاندن (٤) ئاگا لێ بوون؛ هەستپێکردن (بە مێشك)؛ پێ زانین
(٥) وا زانین؛ بڕوا وەها بوون؛ بڕواکردن.

*v.i.* (١) هەستکردن؛ هەست بوون.

(٢) وا هاتنه بەرچاو یا بەر هەست؛ وا هەستکردن
*( The water ~s warm.)*
(٣) پەل کوتان؛ دەست کوتان بەم لاو بەولادا بۆ دۆزینەوە؛ بۆ گەڕان (بە هەست).
(٤) هەستکردن بە جۆرێکی تایبەتی: *( I ~ sad, happy, etc.)*.
(٥) هەست جووڵان: هاوهەستکاری؛ هاوسۆزکاری
***n.*** (١) هەستکردن: هەستکاری (٢) هەستی دەست تێوەدان.
(٣) هەست جووڵان
**feel ( a person ) out,** لە بیروڕای کەسێك ئاگاداربوون یا لێ دەرهێنانی بە پرسیارکردنی ناڕاستەوخۆ.
**feel like,** [Colloq.], حەزکردن؛ ویستن؛ ئارەزوو بوون؛ هەوەس بوون.
**feel up to,** [Colloq.], توانین؛ تاقەت بوون؛ لە ووزەدا بوون
**feeler** (fēl′ẽr), ***n.*** (١) هەستکەر (مرۆڤ، شت)؛ هەستەوەر
(٢) هەستەشاخ (جانەوەر)
(٣) پرسیارێك یا کردەوەیەك کە بیروڕاو هەستی کەسێکی پێ دەدۆزرێتەوە.
**feeling** (fēl′iŋ), ***adj.*** بەسۆز؛ بەهەست؛ هاوسۆز:
*( a ~ person, heart, etc.)*
***n.*** (١) هێزی هەستکردن (بە دەست)؛ هۆش.
(٢) هەست *( a ~ of joy)*.
(٣) سۆز (٤) جۆش (بەتایبەتی هەستی تووڕەیی).
(٥) بیروڕا؛ و زانین.
**feet** (fēt), *plural of* foot.
**carry ( or sweep ) off one's feet,** دڵفڕاندن؛ هێنانە جۆش؛ لەپڕ کەوتنە خۆشەویستی کەسێکەوە
**on one's feet,** (١) بە پێوە (٢) چەسپیو؛ ڕەگ داکوتاو؛ قایم.
**sit at the feet of,** لەبەر پێدا دانیشتن (وەك قوتابی)
**stand on one's own feet,** سەربەخۆ بوون؛ پشت بە خۆ بەستن؛ یارمەتی کەس نەویستن.
**feign** (fān), ***v.t.*** (١) پێکەوەنان (٢) هەڵبەستن (درۆ، چیرۆك).
(٣) هێنانە بەرچاوی خۆ
(٤) وا دەرخستن؛ بە درۆ وا پیشاندان؛ لاسایی کردنەوە.
***v.i.*** وا دەرخستن بە درۆ؛ بە درۆ وا پیشاندان؛ بە درۆ نوواندن
**feigned** (fānd), ***adj.*** درۆ؛ درۆزنە؛ هەڵبەستراو؛ سەرزاری؛ ڕووالەت.
**felicitate** (fə-lis′ə-tāt′), ***v.t.*** (١) پیرۆزبایی لێکردن
(٢) [Rare]، دڵخۆش کردن.
**felicitation** (fə-lis′ə-tā′shən), ***n.*** پیرۆزبایی
**felicitous** (fə-lis′ə-təs), ***adj.*** (١) بەجێ (ووتە، کردار)؛ گونجاو؛ شیاو. (٢) لێهاتوو لە ووتەو کردەوەی بەجێدا.
**felicity** (fə-lis′ə-ti), ***n.*** (١) شادی؛ بەختیاری؛ کامەرانی؛ خۆشی.
(٢) سەرچاوە یا هۆی شادی. (٣) ووتە یا بیرێکی بەجێ.
**felid** (fē′lid), ***n.*** پشیلە؛ هەرچ گیاندارێك کە لە توخم و تیرەی پشیلە بێت.
**feline** (fē′līn), ***adj.*** (١) تایبەتی بە پشیلە؛ پشیلەیی (٢) فێڵباز.
***n.*** هەرچ گیاندارێك لە توخم و تیرەی پشیلە (وەك پڵنگ، شێر، ڕێز... هتد).
**fell** (fel), *past tense of* fall.
**fell** (fel), ***v.t.*** (١) دان بە زەویدا؛ خستن.
(٢) بڕینەوە (درەخت)؛ داپاچین؛ بڕین.
***n.*** ئەو درەختانەی لە وەرزێکدا دەبڕرێتەوە.
**fell** (fel), ***adj.*** (١) بێ بەزەیی؛ درندە؛ توندوتیژ.
(٢) [Archaic]. کوشندە
**fell** (fel), ***n.*** پێستە یا پێستی گیاندار.
**fell** (fel), ***n.*** گردێکی بەرد نی یا ڕووتەنی.
**feller** (fel′ẽr), ***n.*** [Slang or Dial.]. = **fellow.**
**fellmonger** (fel′muŋ′gẽr), ***n.*** بازرگانی پێستە.
**fellow** (fel′ō, fel′ə), ***n.*** (١) هاوڕێ؛ ناوەڵ؛ برادەر
(٢) کەسێکی هەمان پلەوپایە. (٣) دانەیەك لە جووتی شت.
(٤) قوتابییەکی خوێندنی بەرز لە زانکۆدا کە یارمەتی دارایی پێ درابێت.
(٥) ئەندامی کۆمەڵێکی زانیاری. (٦) [Obs.]: کەسێکی پلەوپایە نزم.
(٧) [Colloq.]، زەلام؛ کابرا؛ کەس؛ پیاو.
(٨) [Colloq.]، دڵدار؛ دۆست.
***adj.*** هاو؛ هاونیلە: *( ~ workers; ~ students)*.
**fellowship** (fel′ō-ship′), ***n.*** (١) برادەرێتی؛ هاوڕێیەتی؛ برادەری؛ دۆستایەتی. (٢) کۆمەڵە؛ کۆمەڵە برادەر.
(٣) یارمەتی دارایی کە دەدرێت بە قوتابییەکی زانکۆ.
(٤) پلەوپایەی قوتابییەکی خوێندنی بەرز کە یارمەتی دارایی پێ درابێت
**felly** (fel′i), ***n.*** قەراغی پێچکە؛ پێچکە.
**felon** (fel′ən), ***n.*** کەسێکی تاوانبار؛ گوناهبار
***adj.*** تاوانبار؛ گوناهبار؛ بەد.
-felonious *(adj.)*.
**felony** (fel′ə-ni), ***n.*** تاوان؛ تاوانێکی گەورە (وەك پیاو کوشتن، ئاگر بەردانەوە، بەزۆر سواربوونی ئافرەت).
**felt** (felt), ***n.*** (١) لباد (کە لە خوری و فەرو یا تووك درووست دەکرێت).
(٢) بەرگی لە لباد درووستکراو
***adj.*** لە لباد درووستکراو.
**felt** (felt), *past tense and past participle of* **feel.**
**female** (fē′māl), ***adj.*** (١) مێ؛ مێینە؛ مێچکە.
(٢) لە ژن و کچ پێکهاتوو.
***n.*** ئافرەت؛ ژن؛ گیاندار یا ڕووەکی مێ
**feme** (fem), ***n.*** (١) خێزان؛ ژن. (٢) ئافرەت
**feminine** (fem′ə-nin), ***adj.*** (١) مێ؛ مێینە.
(٢) ناسك؛ ژنانە؛ ژنانەیی. (٣) بۆ ئافرەت شیاو. (٤) سەرژنانە.
(٥) تایبەتی بە مێ (ڕێزمان).
***n.*** (١) توخمی مێ (ڕێزمان). (٢) ووشەیەك کە نیشانەی توخمی مێ بێت.
**femininity** (fem′ə-nin′ə-ti), ***n.*** (١) ژنێتی؛ کچێتی؛ ناسکی
(٢) ژنان؛ ئافرەتان.
**feminism** (fem′ə-niz′m), ***n.*** بیروباوەڕی یەکسانی ژن و پیاو لە مافدا؛ جووڵانەوەی هێنانەدی یەکسانی ژن و پیاو لە مافدا.
**feminist** (fem′ə-nist), ***n.*** ئافرەتێك کە لایەنگری یەکسانی ژن و پیاو بێت لە مافدا.
***adj.*** تایبەتی بە یەکسانی ژن و پیاو لە مافدا؛ تایبەتی بە لایەنگرانی ئەم یەکسانییە.
**feminize** (fem′ə-nīz′), ***v.t. & v.i.*** ناسك کردن؛ سەرژنانە کردن؛ بوون بە سەرژنانە.
**fen** (fen), ***n.*** زۆنگاو؛ زەلکاو؛ زۆنگ؛ گەناو.
**fence** (fens), ***n.*** (١) پەرژین؛ تەیمان؛ شوورە (٢) شیربازی.
(٣) کارامەیی لە گفتوگۆدا؛ زمانپاراوی.
(٤) فرۆشیارو کڕیاری شتومەکی دزراو. (٥) فرۆشگای شتومەکی دزراو.
***v.t.*** (١) ( **in** ~ )، پەرژین کردن؛ تەیمان کردن.
(٢) [Archaic]، پاراستن.
***v.i.*** (١) شیربازی کردن. (٢) وەڵامی ڕاستەوخۆ نەدان؛ خۆ بەدەستەوەنەدان؛ خۆ لێ لادان (پرسیارو وەڵام). (٣) کڕین و فرۆشتنی شتومەکی دزراو.
**on the fence,** بێ لایەن؛ لایەن نەگرتن.
**fencer** (fen′sẽr), ***n.*** (١) شیرباز. (٢) وەستای شیر؛ شیر درووستکەر
**fencing** (fen′siŋ), ***n.*** (١) شیربازی. (٢) گفتوگۆ.
(٣) کەرەسەی پەرژین یا تەیمان (زی، تەلبەن... هتد).
(٤) پەرژین؛ تەیمان؛ شوورە
**fend** (fend), ***v.t.*** [Archaic or Poetic], پاراستن.
***v.i.*** بەرهەڵستی کردن.
**fend for oneself,** خۆ پاراستن؛ چارەسەری کاری خۆ کردن؛ کاری خۆ ڕایی کردن بەبێ یارمەتی کەس.
**fend off,** بەرهەڵستی کردن و گەڕاندنە دواوە؛ لە خۆ دوورخستنەوە؛ خۆ ڕاگیرکردن لەبەر هێرشداو گەڕاندنەوە.

**fender** (fen′dēr), *n.* هۆی پاراستن (ا) (دەعامیە)ی ئوتومبیل.
(ب) ئامێرێکی وەها لەبەردەمی شەمەندەفەردا بۆ لادانی شتی سەر هێڵە ئاسنینەکە یا لادانی گیاندار لەسەر ڕێی شەمەندەفەرەکەدا.
(ج) شوورەی ئاگردان (د) کوشنێك کە قەراغی کەشتی دەپارێزێت لە کاتی لەنگەر هاویشتندا

**fenugreek** (fen′yoo-grēk′), *n.* شملی.

**ferment** (fũr′mənt), *n.* (١) هەوێن (٢) مەیین؛ ترشان.
(٣) جۆش؛ جم‌وجوول.
*v.t.* (١) مەیاندن؛ مەیین
(٢) هێنانە جۆش؛ جم‌وجوول تێخستن.
*v.i.* (١) مەیین؛ ترشان. (٢) هاتنە جۆش؛ جم‌وجوول تێکەوتن.

**fermentation** (fũr′mən-tā′shən), *n.* (١) مەیین؛ ترشان.
(٢) جۆش؛ جم‌وجوول.

**fern** (fũrn), *n.* سەرخەس؛ ڕووەکێکی هەمیشە سەوزی ناو باخچەی ماڵە.

**fernery** (fũr′nēr-i), *n.* (١) باخچەی سەرخەس.
(٢) کۆمەڵێك سەرخەس.

**ferocious** (fi-rō′shəs), *adj.* (١) دڕ؛ دڕندە؛ هار
(٢) [Colloq.]، زۆر؛ ئێجگار زۆر: *( a ~ appetite)* .

**ferocity** (fi-ros′ə-ti), *n.* دڕی؛ دڕنتی؛ هاری

**-ferous** (fēr-əs), پاشگرێکە بەمانای بەرهەمهێن؛ بەرهەمدار.

**ferreous** (fer′i-əs), *adj.* (١) ئاسندار؛ ئاسناوی.
(٢) ئاسنین؛ زۆر ڕەق.

**ferret** (fer′it), *n.* شریتێکی باریکی لۆکە، خوری، یا ئاوریشم.

**ferret** (fer′it), *n.* گیاندارێکە وەك ڕسق وایە بەڵام گەورەترەو دڕە.

**ferric** (fer′ik), *adj.* ئاسناوی؛ ئاسندار؛ تایبەتی بە ئاسن.

**ferrule** (fer′əl, fer′ool), *n.* (١) پارچە ئاسنێکە دەدرێت لە کلکی گۆچان یا سەری داردەست بۆ قلیش نەبردنی‌و بەهێزکردنی.
(٢) بۆرییەکی کورتی بچووکە بۆ لێکدانی جومگە (مەکینەکاری).

**ferry** (fer′i), *v.t.* (١) لە کەنداو یا ڕووبار پەڕاندنەوە بە کەڵەك یا بەلەم.
(٢) فڕۆکە گەیاندن بۆ جێگەی مەبەست بە فڕینی بۆ ئەو شوێنە.
*v.i.* لە کەنداو یا ڕووبار پەڕینەوە بە کەڵەك یا بەلەم.
*n.* (١) کەڵەك؛ قەیاغ؛ بەلەم یا کەشتییەك بۆ پەڕاندنەوەی ڕێبوارو شتومەك لە کەنداو یا ڕووبارێك. (٢) شوێنی پەڕینەوەی بەلەم یا کەشتییەکی وەها.
(٣) مافی ئەم جۆرە پەڕاندنەوەیە. (٤) گەیاندنی فڕۆکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە فڕینیان.

**ferryboat** (fer′i-bōt′), *n.* بەلەمی ڕێبوارو شتومەك پەڕاندنەوە لە کەنداوو ڕووبار.

**ferryman** (fer′i-mən), *n.* خاوەن، بەڕێوەبەر، یا کرێکاری کەڵەك یا بەلەمی پەڕاندنەوە لە کەنداوو ڕووبار؛ بەلەمەوان.

**fertile** (fũr′t'l), *adj.* (١) بەپیت؛ بەبرشت؛ بەبەر؛ بەبەرەکەت.
(٢) هۆکاری بەپیتی. (٣) بەردار؛ بەرگر؛ سك کەر (گیاندار).
(٤) پیتکراو *( ~ eggs)*

**fertility** (fēr-til′ə-ti), *n.* پیت؛ بەپیتی. برشت؛ بەبرشتی؛ بەبەری؛ بەرداری؛ سکپڕبوون.

**fertilize** (fũr′t'l-īz′), *v.t.* (١) بەهێزکردن (زەوی‌وزار)؛ پەین تێکردن.
(٢) پیتکردن؛ لەیەکدانی تۆوی نێرو هێلکەی مێ (هێلکە، مرۆڤ):
*( to ~ eggs)*
**-fertilization** *(n.)*.

**fertilizer** (fũr′t'l-īz′ēr), *n.* (١) پەین؛ پەینی کیمیایی زەوی
(٢) لەیەکدەر؛ بەپیتکەر؛ لەیەك چاککەر: *( Bees are ~s of flowers.)* .

**ferula** (fer′yoo-lə, fer′oo-lə), *n.* (١) جۆرە ڕووەکێکە وەك کەرەوز.
(٢) داردەستی مامۆستا. (٣) داردەستی فەرمانڕەوا؛ گورزی پاشا.

**ferule** (fer′əl, fer′ōōl), *n.* داردەستی مامۆستا (بۆ تەمێ کردنی قوتابی)
*v.t.* لێدان یا تەمێ کردن بەم داردەستە

**fervency** (fũr′vən-si), *n.* جۆش؛ تین؛ گەرمی (سۆز).

**fervent** (fũr′vənt), *adj.* (١) گەرم؛ بەتین. (٢) بەجۆش؛ بەتین؛ بەگەرم.
**-fervently** *(adv.)*.

**fervor** (fũr′vēr), *n. Also* **fervour**, (١) گەرمایی؛ گەرمی‌یەکی زۆر.
(٢) جۆش؛ تین (هەست)؛ هەستی گەرم.

**festal** (fes′t'l), *adj.* جەژنی؛ زەماوەندی؛ خۆش؛ شاد.

**fester** (fes′tēr), *n.* دوومەڵ.
*v.i.* (١) کێم کردن. (٢) ڕزین.
(٣) پەنگ خواردنەوەو دڵ ئازاردان (بیرەوەری، هەست)؛ دڵ ڕەش کردنەوە؛ دڵ پڕبوون: *( The insult ~ed in his mind.)* .
*v.t.* (١) بوون بەهۆی کێم کردن. (٢) دڵ لێ ڕەش کردنەوە؛ داخ کردن بە دڵەوە؛ دڵ لێ پڕکردن.

**festival** (fes′tə-v'l), *n.* جەژن؛ ئاهەنگ؛ زەماوەند؛ ئاهەنگ‌و زەماوەند.
*adj.* تایبەتی بە ئاهەنگ‌و زەماوەند.

**festive** (fes′tiv), *adj.* خۆش (ڕوودان، کات، شوێن)؛ شاد؛ زەماوەندی:
*( a ~ scene, atmosphere, etc.)*

**festivity** (fes-tiv′ə-ti), *n.* (١) خۆشی‌و شادی؛ کەیف‌و ڕابواردن.
(٢) (ا) زەماوەند؛ ئاهەنگ؛ جەژن. (ب) (*pl.*)، ڕوودانی کاتی ئاهەنگ‌و زەماوەند.

**festoon** (fes-tōōn′), *n.* چەپکەیەك گوڵ‌و گەڵا (کە کرابێت بە شریتێکی بازنەیی یا پێچاوپێچەوە).
*v.t.* (١) ڕازاندنەوە بەم جۆرە چەپکە گوڵ‌و گەڵایە. (٢) چەپکە چەپکە کردن.
(٣) لێکدان بە چەپکە گوڵ‌و گەڵا.

**festoonery** (fes-tōōn′ēr-i), *n.* چەند چەپکە گوڵ‌و گەڵایەك (کە کرابن بە شریتەوە).

**fetal** (fē′t'l), *adj.* ئاوڵەمەیی؛ وەك ئاوڵەمە.

**fetation** (fē-tā′shən), *n.* پێکهاتن‌و گەورەبوونی ئاوڵەمە؛ سکپڕی

**fetch** (fech), *v.t.* (١) هێنان (شت، مرۆڤ، گیاندار)؛ چوون بۆی‌و هێنانی:
*( Will you ~ a doctor at once?; Please ~ me the dictionary.)*
(٢) هێنان (نرخ)؛ بەهابوون؛ ئەوەندە پارە کردن:
*( This old car won't ~ you much.)*
(٣) دەرهێنان؛ لێ دەرهێنان. (٤) هەناسە هەڵکێشان.
(٥) لێوە بۆ دەرکەوتن (بیروباوەڕ). (٦) دڵ ڕاکێشان؛ سەرنج ڕاکێشان
(٧) [Colloq.]، پیاکێشان؛ پیامالین.
*v.i.* (١) بۆی چوون‌و هێنانی. (٢) هێنانەوەی نێچیری کوژراو (سەگی ڕاو)
(٣) (ا) ڕێبازێکی تایبەتی گرتن (کەشتی).
(ب) لە ڕێگە لادان (کەشتی)؛ پێچکردنەوە.
*n.* (١) هێنان؛ هێنانەوە؛ بۆ چوون‌و هێنانەوە. (٢) فێڵ؛ خۆ لادان.
**fetch and carry**, وردە کار کردن؛ کاری ناگرنگ کردن.
**fetch up**, گەیشتنە شوێنێك‌و وەستان.

**fetching** (fech′iŋ), *adj.* [Colloq.], دڵفڕێن؛ جوان؛ قەشەنگ.

**fete, fête** (fāt), *n.* ئاهەنگ‌و زەماوەند (لە جێگەیەکی کراوە).
*v.t.* ئاهەنگ‌و زەماوەند بۆ گێڕان (بۆ ڕێز لێگرتن).

**feticide** (fē′tə-sīd′), *n.* منداڵ لەباربردن؛ ئاوڵەمە کوشتن.

**fetid** (fet′id, fē′tid), *adj.* بۆگەن.

**fetish** (fē′tish, fet′ish), *n.* (١) جادوو؛ ئەفسوون؛ شتێك کە گوایە هێزی ئەفسوونی هەیە. (٢) شتێکی خۆشەویست بە ڕادەی پەرستن:
*( to have a ~ for a thing)*
(٣) شتێکی هەوەس هەڵسێنەر.
**-fetishism** *(n.)*; **fetishist** *(n.)*.

**fetlock** (fet′lok′), *n.* (١) مووی پشت دەست‌و پاشووی ئەسپ‌و ماین.
(٢) ئەو جومگەیەی ئەم مووەی پێوەیە.

**fetter** (fet′ēr), *n.* (١) (*pl.*)، پێوەند؛ زنجیری قاچ؛ کۆت.
(٢) کۆت؛ تەوق؛ شتێکی بەستەرەوە.
*v.t.* (١) پێوەندکردن؛ زنجیر کردنە قاچ.
(٢) بەستنەوە؛ ڕێ لێگرتن؛ وەستاندن

**fetterlock** (fet'ēr-lok'), ***n.*** = **fetlock.**
**fetus** (fē'təs), ***n.*** ئاوڵەمە
**feud** (fūd), ***n.*** دوژمنایەتی‌یەکی بەتین‌و زۆر خایەن (بەتایبەتی لەنێوان دوو خێڵدا).
***v.i.*** دوژمنایەتی کردن (بۆ ماوەیەکی زۆر)؛ شەڕکردن
**-feudal** ***(adj.).***
**feud** (fūd), ***n.*** زەوی‌وزارێکە کە وەرزێر لە دەرەبەگی بە کرێ دەگرێت یا کاری بۆ دەکات لەباتی.
**feudal** (fū'd'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە زەوی‌وزارێکە کە وەرزێر لە دەرەبەگی بە کرێ گرتبێ یا کاری بۆ بکات لەباتی.
(٢) دەرەبەگی؛ تایبەتی بە ڕژێمی دەرەبەگێتی.
**feudalism** (fū'd'l-iz'm), ***n.*** دەرەبەگێتی؛ ڕژێمی دەرەبەگایەتی
**feudalistic** (fū'd'l-is'tik), ***adj.*** تایبەتی بە دەرەبەگێتی؛ دەرەبەگێتی‌یانە ***(a ~ society).***
**fever** (fē'vēr), ***n.*** (١) تا؛ لەرزوتا
(٢) بێ ئارامی؛ جموجووڵ‌و جۆشێکی زۆر.
**feverish** (fē'vēr-ish), ***adj.*** (١) لەرزوتادار؛ تادار.
(٢) بوو بە هۆی لەرزوتا. (٣) لەرزوتا تیا بڵاو (وولات).
(٤) بێ ئارام؛ بێ سرەوت؛ بەجۆش.
**feverous** (fē'vēr-əs), ***adj.*** = **feverish.**
**few** (fū), ***adj., pron. & n.*** ژمارەیەکی کەم؛ هەند؛ چەند؛ کەم؛ تاك‌وتەرا
**quite a few,** [Colloq.], گەلێك؛ زۆر؛ ژمارەیەکی زۆر.
**fez** (fez), ***n.*** فێستە؛ فێست
**fiancé** (fē'än-sā', fē-än'sā), ***n.*** دەزگیران (کوڕ)؛ مارەبڕ.
**fiancée** (fē'än-sā', fē-än'sā), ***n.*** دەزگیران (کچ)؛ مارەبڕ.
**fiasco** (fi-as'kō), ***n.*** شکستی (نشوستی)؛ ژێرکەوتن.
**fiat** (fī'ət, fī'at), ***n.*** (١) فەرما ـ فەرمانی میری
(٢) دەسەلات پێدان؛ ڕێ پێدان.
**fiat money,** دراوی کاغەز کە میری دەریدەکات بێ ئەوەی بەرامبەر بەو دراوە ئاڵتوونی هەبێت لە خەزێنەدا.
**fib** (fib), ***n.*** درۆیەکی بچووك؛ درۆ؛ کەڵەك.
***v.i.*** درۆیەکی بچووك کردن؛ درۆکردن.
**fibber** (fib'ēr), ***n.*** درۆزن؛ درۆی بچووك کەر؛ درۆکەر.
**fiber, fibre** (fī'bēr), ***n.*** (١) ریشاڵ (٢) گوش (٣) چۆنێتی.
(٤) سرووشت (مرۆڤ)؛ ڕەووشت: ***(a man of strong moral ~).***
**fiber glass,** ریشاڵی شووشەیی (بۆ ئاواخنی دیوارو سەربان).
**fibrosis** (fī-brō'sis), ***n.*** زۆربوونی شانە یا تێشووی ریشاڵەیی لە ئەندامێکی لەشدا.
**fibrous** (fī'brəs), ***adj.*** (١) ریشەلاوی؛ ریشاڵدار.
(٢) وەك ریشاڵ؛ ریشاڵی.
**fickle** (fik''l), ***adj.*** بێ بار؛ دەمدەمی؛ حوڵحوڵ؛ بیارفرۆش.
***(a ~ lover; ~ weather)***
**-fickleness** ***(n.).***
**fiction** (fik'shən), ***n.*** (١) هەڵبەست (٢) شتێکی هەڵبەستراو؛ درۆ.
(٣) چیرۆك؛ داستان؛ ڕۆمان.
**fictional** (fik'shən-'l), ***adj.*** (١) هەڵبەستراو؛ درۆ.
(٢) تایبەتی بە چیرۆك یا نووسراوی هەڵبەستراو.
**fictitious** (fik-tish'əs), ***adj.*** (١) هەڵبەستراو؛ ئەفسانەیی؛ هەڵبەست.
(٢) درۆ؛ درۆزنە؛ دروستکراو: ***(a ~ name).***
**fiddle** (fid''l), ***n.*** (١) کەمانچە؛ ئامێرێکی مۆسیقایە لە کەمانچە دەچێ.
(٢) شوورەیەکی سەر مێزی کەشتی بۆ نەکەوتنە خوارەوەی قاپ... هتد.
***v.t.*** (١) [Colloq.]. کەمانچەلێدان؛ کەمانچەژەندن.
(٢) کات بەفیڕۆدان؛ کات کوشتن؛ خۆ خڵافاندن.
***v.i.*** (١) [Colloq.]، کەمانچەلێدان. (٢) جرت‌وفرت کردن؛ جرینی کردن.
**fit as a fiddle,** تەندروست؛ تەندرووست باش.
**play second fiddle,** پاشکۆیەتی کردن؛ ژێردەستی کردن.
**fiddle-deedee** (fid''l-dē'dē'), ***n. & interj.*** قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ.
**fiddle-faddle** (fid''l-fad''l), ***n. & interj.*** [Colloq.], قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ.
***v.i.*** [Colloq.], خۆ خەریك کردن بە شتی هیچ‌وپووچەوە.
**fiddler** (fid'lēr), ***n.*** کەمانچەژەن؛ کەمانچەلێدەر.
**fiddling** (fid'liŋ, fid''l-iŋ), ***adj.*** (١) کەمانچەژەن؛ کەمانچەلێدەر.
(٢) هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ.
**fidelity** (fī-del'ə-ti, fə-del'ə-ti), ***n.*** (١) دڵسۆزی؛ داوێن پاکی ژن‌و مێرد. (٢) ووردی‌و ڕاستی تۆمارکردن:
***(to copy a document with ~)***
**fidget** (fij'it), ***n.*** (١) بێ ئارامی؛ نەسرەوتن.
(٢) کەسێکی بێ ئارام‌و جرین‌و جرت‌وفرتکەر.
***v.i.*** جرت‌وفرت کردن؛ جرینی کردن؛ بێ ئارامی:
***(She ~ed with her necklace.)***
***v.t.*** جرت‌وفرت پێکردن؛ خستنە جرت‌وفرت.
**-fidgetiness** ***(n.).***
**fidgety** (fij'it-i), ***adj.*** جرت‌وفرتکەر؛ جرین؛ بێ ئارام.
**fie** (fī), ***interj.*** شوورەیی‌یە!
**fief** (fēf), ***n.*** (١) زەوی‌وزارێکە کە دەرەبەگ دەیدات بە وەرزێرێك لەباتی بەردەستی کردن‌و کار بۆ کردنی. (٢) مافی دەست پێوەگرتنی ئەم زەوی‌وزارە
**field** (fēld), ***n.*** (١) ***(pl.)*** ، دەشت. (٢) زەوی؛ کێڵگە؛ لەوەڕگا؛ جاڕ.
(٣) گۆڕەپان: ***(a football ~)*** . (٤) کان: ***(a gold ~)*** .
(٥) (ا) مەیدانی جەنگ. (ب) جەنگ. (ج) مەیدانی سوپایی.
(٦) مەودای پسپۆڕی؛ مەودای زانیاری یا کار: ***(the ~ of science)***
(٧) گۆڕەپانی ملەملێی وەرزشی.
(٨) ڕووی قەڵغان. (٩) مەودا (فیزیا).
***adj.*** (١) تایبەتی بە مەیدان، زەوی، کێڵگە، یا گۆڕەپان.
(٢) بەرهەمی کێڵگەیە.
***v.t.*** گرتنەوەو یاری پێکردنی تۆپ (وەرزش).
**play the field,** خۆ نەبەستنەوە بە یەك شت، کار، یا چالاکی‌یەوە؛ خەریکی هەمە چالاکی‌یەك بوون.
**take the field,** دەستپێکردن (وەرزش، مەشقی سوپایی).
**field glass, field glasses,** دووربینێکی زۆر بەهێز
**field gun,** تۆپ.
**field hand,** وەرزێر.
**field hospital,** نەخۆشخانەی سوپایی نزیك مەیدانی جەنگ.
**field marshal,** سوپا سالار؛ مارشاڵی مەیدان.
**field trip,** گەشتی مەیدانی (بۆ کۆکردنەوەی زانیاری‌و مەشقی ڕاستەوخۆی قوتابی).
**field work,** کاری مەیدانی (کە بریتی‌یە لە کۆکردنەوەی زانیاری).
**fiend** (fēnd), ***n.*** (١) شەیتان. (٢) کەسێکی بەد.
(٣) [Colloq.]، (ا) کەسێکە زۆر خولیای شتێکی هەبێت:
***(a cigareete ~)***
(ب) کەسێکی زۆر کارامەو لێهاتوو لە کارێکدا: ***(He is a ~ at tennis.)***
**the Fiend,** شەیتان.
**fiendish** (fēn'dish), ***adj.*** شەیتانانە؛ شەیتان ئاسا؛ بەد.
**fiendlike** (fēnd'līk'), ***adj.*** = **fiendish.**
**fierce** (fērs), ***adj.*** (١) دڕ؛ هار؛ دڕندە: ***(a ~ dog)*** .
(٢) توندوتیژ؛ بەهێز؛ توندوقایم: ***(a ~ storm)*** .
(٣) گەرم (جەنگ)؛ توندوتیژ؛ بەجۆش.
(٤) [Slang]، پیس‌و بۆگەن؛ بەد؛ ناپەسەند.
**fiery** (fī'ri, fī'ēr-i), ***adj.*** (١) ئاگرین؛ ئاگری. (٢) گەرم.

(۳) بەجۆش: توندوتیژ: *( ~ words)* .
(٤) زووهەڵچوو (مرۆڤ): *( a ~ nature)* .
(٥) زووگرگر؛ ئاگرگر؛ بسووت .
(٦) هەوکردوو (برین)؛ سوورهەڵگەڕاو؛ دڵگیرساو (برین).
**fiesta** (fi-es′tə), *n.* (١) زەماوەندێکی ئاینی.
(٢) زەماوەندێکی ئیسپانییە.
**fife** (fīf), *n.* زوڕنا؛ شمشاڵ
*v.t. & v.i.* زوڕنالێدان
**fifteen** (fif′tēn′), *n. & adj.* پانزە؛ پازدە
**fifteenth** (fif′tēnth′), *adj.* پانزەهەم
**fifth** (fifth), *adj. & n.* پێنجەم؛ پێنجەمین
**fifth column,** دەستەی سەر بە دوژمن (کە لە دڵەوە حەز بە سەرکەوتنی دوژمن دەکەن بەسەر وڵاتەکەی خۆیانداو بە دزییەوە هەوڵیشی بۆ دەدەن).
**fiftieth** (fif′ti-ith), *adj. & n.* پەنجاهەم؛ پەنجاهەمین.
**fifty** (fif′ti), *adj. & n.* پەنجا
**the fifties,**ساڵە پەنجاکان (هی سەدەیەک یا تەمەنی مرۆڤێک).
**fifty-fifty** (fif′ti-fif′ti), *adj. & adv.* [Colloq.]. ئەوەندەی یەک؛ وەك یەك؛ یەکسان؛ نیوانیو.
**fig** (fig), *n.* (١) هەنجیر (٢) دار هەنجیر.
(٣) ئەختێک؛ هەندێکی بێ نرخ یا هیچوپووچ:
*( Their opinion wasn't worth a ~ .)*
(٤) نیشانەیەکی سووک بە پەنجە (پەنجەگەورە خستنەناو پەنجەی شایەتمان و پەنجەدرێژەوە)
**fight** (fīt), *v.i.* (١) شەڕکردن؛ جەنگین؛ جەنگ کردن
(٢) بەربەرەکانی کردن؛ خەبات کردن؛ بەرهەڵستی کردن.
*v.t.* (١) شەڕ لەگەڵ کردن؛ شەڕکردن؛ جەنگ لەگەڵ کردن
(٢) خەبات کردن؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەربەرەکانی کردن.
(٣) بە هەوڵ و خەبات دەسکەوتن
*n.* (١) شەڕ؛ جەنگ. (٢) دەمەقاڵێ؛ هەرا؛ ئاژاوە.
(٣) توانا و ئامادەیی شەڕکردن.
**fight it out,** شەڕکردن تا لایەك دەبەزێت.
**fight off,** بەرهەڵستی کردن؛ بەربەرەکانی کردن؛ لە خۆ دوورخستنەوە.
**fighter** (fīt′ēr), *n.* (١) شەڕکەر؛ جەنگاوەر. (٢) بۆکسباز.
(٣) فڕۆکەی جەنگ
**figment** (fig′mənt), *n.* چیرۆکی هەڵبەستراو؛ شتێکی خەیاڵ کردە یا هەڵبەستراو
**figurative** (fig′yoor-ə-tiv), *adj.* (١) هێمایی
(٢) تایبەتی بە وێنەکردن (٣) مەجازی؛ بڕیتی (زمانەوانی).
**figure** (fig′yoor), *n.* (١) شێوە
(٢) لەش و لار؛ بەژن و باڵا؛ قەدوباڵا؛ بیچم؛ پەیکەر
(٣) کەس (بەتایبەتی هی بەناو)؛ مرۆڤ.
*( Roosevelt was one of the greatest ~s of his time.)*
(٤) وێنە (کەس، شت). (٥) نەخشە.
(٦) ژمارە؛ نمرە *( the ~ 5 )*
(٧) ( *ol* ) ژمارە؛ ژمێرە؛ حساب (٨) هەندێك دراو یا پارە.
(٩) چەند هەنگاوێکی سەماکردن (١٠) شێوە (ئەندازە).
(١١) مەجاز (ڕەوانبێژی).
*v.t.* (١) شێوەپێدان؛ وێنەکردن. (٢) هێنانە بەرچاوی خۆ.
(٣) بە نەخشە ڕازاندنەوە (٤) ژماردن؛ لێکدانەوە
(٥) [Colloq.]. بڕوابوون؛ وا زانین (٦) بە مەجاز دەربڕین (ڕەوانبێژی).
*v.i.* (١) باش دیاربوون (٢) ژماردن. (٣) [Colloq.]. لێکدانەوە؛ ڕەچاوکردن.
**figure on,** (١) پشت پێ بەستن؛ بەتەمابوون
(٢) نەخشەدانان؛ نەخشە بۆ کێشان
**figure out,** (١) لێکدانەوە؛ ژماردن؛ هەڵهێنان
(٢) تێگەیشتن؛ بۆ دەرکەوتن؛ سەر لێ دەرچوون؛ زانین.

**figure up,** کۆکردنەوە (ژمارە).
**figurehead** (fig′yoor-hed′), *n.* (١) پەیکەری سەر لووتی کەشتی.
(٢) سەرۆکی هەر بەناو و بێ دەسەڵات.
**figure of speech,** مەجاز (ڕەوانبێژی).
**figurine** (fig′yoo-rēn′), *n.* پەیکەرێکی بچووك.
**filament** (fil′ə-mənt), *n.* (١) تاڵ؛ دەزوو.
(٢) تەلی ناو گڵۆپی ئەلەکتریك. (٣) تەختە گوڵ.
**filbert** (fil′bērt), *n.* (١) (بندق)؛ بەرەدارێکە وەك کەستەنە وایە.
(٢) درەختی (بندق).
**filch** (filch), *v.t.* دزین (شتێکی هیچوپووچ).
**file** (fīl), *n.* (١) فایل. (٢) ڕیز (مرۆڤ، شت)
(٣) ڕیزە خانەی شەترەنج.
*v.t.* (١) خستنە فایلەوە؛ ڕێك و پێك کردن لە فایلدا.
(٢) تۆمارکردنی بەڵگەنامەیەك لە دادگادا.
*v.i.* بە ڕیز ڕۆیشتن: *( The children ~ed out of the building.)* .
**in file,** بە ڕیز.
**on file,** لە فایلدایە.
**file** (fīl), *n.* بڕبەنگ.
*v.t.* لە بڕبەنگ دان؛ بە بڕبەنگ ساف کردن.
**filet** (fi-lā′, fil′ā, fil′it), *n.* (١) تۆڕێك یا چنراوێکی نەخشەی چوارگۆشەدار. (٢) پارچە گۆشتی تەنك (گاو مانگاو ماسی).
**filet mignon** (fi-lā′ min-yōn′, fil′ā min-yon), پارچە گۆشتی نەرمەی گا و مانگا.
**filial** (fil′i-əl, fil′yəl), *adj.* فرزەندی؛ هی کوڕ و کچ بۆ دایك و باوك:
*( ~ devotion)*
**filibuster** (fil′ə-bus′tēr), *n.* (١) چەتە (دژی وڵاتێکی بێگانە).
(٢) دەوەن بە ئاش؛ ڕێگەگرتن لە مۆرکردنی گەڵاڵەی یاسایەك لە پەرلەماندا بە زۆر دووان.
*v.i.* (١) چەتەیی کردن (دژی وڵاتێکی بێگانە).
(٢) دەوەن بە ئاش کردن؛ ڕێگەگرتن لە مۆرکردنی گەڵاڵەی یاسایەك لە پەرلەماندا بە زۆر دووان.
**filicide** (fil′ə-sīd′), *n.* (١) منداڵی خۆ کوشتن.
(٢) منداڵی خۆ کوژ.
-filicidai *(adj.)*.
**Filipino** (fil′ə-pē′nō), *n.* فیلیپینی.
**fill** (fil), *v.t.* (١) پڕکردن؛ ئاخنین.
(٢) لە پلەیەکدا بوون یا فەرمانبەرییەك کردن:
*( to ~ an office or position)*
(٣) دانان (لە کار یا فەرمانبەریدا).
(٤) دەرمان ئامادەکردن بەپێی ڕەچەتە؛ داواکاری بەجێهێنان:
*( to ~ a prescription or an order)*
(٥) پڕکردنەوە (درز، کون).
(٦) (ا) تێرکردن. (ب) خواردەمەنی پێدان.
(٧) پڕکردنەوە (چاڵ).
(٨) ئاوساندن (بایەوانی کەشتی).
*v.i.* (١) پڕبوون؛ پڕبوونەوە. (٢) تێربوون.
*n.* (١) ئەوەندەی پێویستە بۆ پڕبوون یا تێربوون.
(٢) تێری؛ ئەوەندەی تێر بکات. (٣) ناوناخن؛ پڕکەر.
(٤) بەستو؛ بەرزاییەکی دەستکرد (وەك هی ڕێگەی هێڵی شەمەندەفەر)
**fill in,** (١) پڕکردن. (٢) پڕکردنەوە (بۆشایی ڕستە)؛ تەواوکردن؛ تێکردن؛ تێخستن. (٣) جێگرتنەوە؛ جێگری کردن.
**fill one in on,** [Colloq.], دوا دەنگوباس پێ گەیاندن:
*( He filled me in on the latest news.)*
**fill out,** (١) پڕبوونەوە؛ پڕبوون؛ ئاوسان؛ قەڵەوبوون.
(٢) پڕکردنەوە (ئیستیمارە).

**fill up,** پڕکردن؛ پڕبوون بەتەواوی

**filler** (fil′ẽr), ***n.*** (١) ناوناخن (٢) درز پڕکەرەوە
(٣) تووتنی ناو جگەرە یا سیگار. (٤) بۆشایی پڕکەرەوە (لە ڕۆژنامەیەکدا).
(٥) دەستەیەک پەڕەی کاغەزی تاک تاک (کە دەخرێتە ناو بەرگێکەوە وەک دەفتەر).

**fillet** (fil′it), ***n.*** (١) سەربێچێکی باریک (بۆ جوانی یا قژ بەستن).
(٢) تیلمە؛ تەلماسک؛ شریت؛ بەند
(٣) پارچەیەک گۆشتی نەرمەی تەنک (گاو مانگاو ماسی).
***v.t.*** (١) بەستن یا ڕازاندنەوە بە پێبەست یا بەندێک.
(٢) ئێسقان لێ دەرهێنان و کردن بە پارچەی تەنک و ڕێک وپێکەوە (گۆشت).

**fill-in** (fil′in′), ***n.*** (١) جێگری سەردەمی (مرۆڤ، شت).
(٢) [Colloq.]. پوختە؛ کورتە.

**filling** (fil′iŋ), ***n.*** (١) پڕکردن؛ پڕبوون.
(٢) ناوناخن بەتایبەتی هی ددانی کلۆر)؛ پڕکەرەوە.

**filling station,** بەنزینخانە

**filly** (fil′i), ***n.*** (١) جوانو ماین؛ نۆما
(٢) [Colloq.]. کچێکی ڕووخۆش و بەجۆش.

**film** (film), ***n.*** (١) سەرتوێژ؛ توێژاڵ؛ توێژی تەنک. (٢) فیلمی کامێرا.
(٣) لێڵایی (چاو)؛ تارمایی سەرچاو؛ پەردەی سەرچاو (نەخۆشی).
(٤) فیلمی سینەما (٥) دەزووی باریک
***v.t.*** (١) بە پەردە یا توێژاڵی تەنک داپۆشین (٢) وێنەگرتن.
(٣) کردن بە فیلمی سینەما؛ فیلم گرتن: *( They ~ed the story.)* .
***v.i.*** (١) داپۆشران بە توێژاڵ یا پەردەی تەنک.
(٢) کران بە فیلمی سینەما.

**filter** (fil′tẽr), ***n.*** پاڵوێنە؛ پاڵێوگە؛ ناوپاڵێو.
***v.t.*** پاڵاوتن
***v.i.*** (١) پاڵاوتن؛ پاڵێوران
(٢) وورده وورده بڵاوبوونەوە: *( The news ~ed through town.)* .

**filth** (filth), ***n.*** (١) پیسی؛ پیسایی؛ گەندوگوو؛ چڵک؛ چڵکنی.
(٢) ڕەووشت خراپی؛ بەدڕەفتاری؛ پیس ڕەفتاری.

**-filthiness** *(n.).*

**filthy** (fil′thi), ***adj.*** (١) پیس؛ چەپەڵ؛ چڵکن.
(٢) ڕەووشت پیس؛ بەدڕەفتار؛ سووک.

**filtrate** (fil′trāt), ***v.t.*** پاڵاوتن
***n.*** شلەی پاڵاوتە

**-filtration** *(n.).*

**fin** (fin), ***n.*** پەڕەکەی ماسی.
***v.t. & v.i.*** پەڕەکە لێکردنەوە

**finagle** (fi-nā′g'l), ***v.t. & v.i.*** گزی کردن؛ فروفێڵ کردن.

**-finagler** *(n.).*

**final** (fī′n'l), ***adj.*** (١) دواهەمین؛ دوا؛ هەرە دوا؛ هی کۆتایی.
(٢) یەکجارەکی؛ نەگۆڕ.
***n.*** (١) دواهەمین شت؛ شتی هەرە دوا.
(٢) (*pl.*) دواهەمین کێبڕکێی وەرزشی
(٣) (*pl.*) [Colloq.]، دوا تاقیکردنەوە (زانکۆ، کۆلیج، قوتابخانە).

**finale** (fi-nä′li), ***n.*** (١) دوا بەشی پارچەیەک مۆسیقا
(٢) دوا بەشی نوواندنێک.
(٣) دوا بەش؛ کۆتایی؛ دوایی؛ پایان.

**finalist** (fī′n'l-ist), ***n.*** بەشداربووی دواهەمین پێشبڕکێ

**finality** (fī-nal′ə-ti), ***n.*** یەکجارەکیتی؛ بڕینەوەی تەواوی.

**finalize** (fī′n'l-īz′), ***v.t.*** بڕینەوە؛ تەواوکردن؛ بە ئەنجام گەیاندن.

**finally** (fī′n'l-i), ***adv.*** (١) لە دواییدا؛ لە ئەنجامدا؛ لە کۆتاییدا؛ ئیتر.
(٢) بە یەکجارەکی

**finance** (fə-nans′, fī′nans), ***n.*** (١) (*pl.*) سامان و دەسکەوتی
وڵات، کۆمپانیا، یا کەسێک. (٢) (ا) دارایی. (ب) داراییکاری؛ داراییناسی.
***v.t.*** (١) پارەدان؛ پارەپێدان؛ دەزگیرۆیی کردن؛ مەسرەف کێشان.
(٢) سەرەوکاری پارە بۆ کردن.

**financial** (fə-nan′shəl, fī-nan′shəl), ***adj.*** دارایی؛
تایبەتی بە دارایی

**-financially** *(adv.).*

**financier** (fin′ən-sêr′, fī′nən-sêr′), ***n.*** (١) پسپۆڕی دارایی؛
داراییزان. (٢) سەرمایەدار؛ پارەدارێکی گەورە (بەتایبەتی کە خەریکی کرداری
دارایی گەورە دەبێت).
***v.t.*** پارەدان؛ پارەپێدان؛ سەرەوکاری پارە بۆ کردن.

**finch** (finch), ***n.*** فیسقە؛ چۆلەکە؛ هەر باڵندەیەکی بچووکی وەک چۆلەکە.

**find** (fīnd), ***v.t.*** (١) ڕێکەوت کردن؛ بە ڕێکەوت دۆزینەوە؛ دۆزینەوە
(٢) دۆزینەوە؛ بۆ گەڕان و دۆزینەوە؛ پەیداکردن.
(٣) بۆ دەرکەوتن؛ زانین؛ پێ زانین. (٤) دۆزینەوەی شتێکی وون بوو
(٥) وا دانان؛ لا وابوون.
(٦) بەرکەوتن؛ لێدان؛ پێداکەوتن: *( The blow found his chin.)* .
(٧) بڕیاردان: *( The jury found him innocent.)* .
***n.*** (١) دۆزینەوە. (٢) شتێکی دۆزراوە (بەتایبەتی بەنرخ)؛ دۆزراوەیەک

**find out,** بۆ دەرکەوتن؛ پێ زانین.

**finder** (fīn′dẽr), ***n.*** (١) دۆزەرەوە (مرۆڤ، ئامێر).
(٢) گەردبینێکی تایبەتی کامێرا (بۆ بینینی ئەوەی لە وێنەکەدا دەردەچێت)
(٣) دووربینێکی بچووک کە بە یەکێکی گەورەترەوە دەبەسترێت.

**finding** (fīn′diŋ), ***n.*** (١) دۆزینەوە. (٢) شتێکی دۆزراوە یا دەرخراو.
(٣) (*pl.*) کەرەسەی کرێکار.
(٤) ئەنجامی لێکۆڵینەوە (لەلایەن زانایەک، دادگەرێک، یا کەسێکی ترەوە).

**fine** (fīn), ***adj.*** (١) باش؛ زۆر باش؛ چاک؛ نایاب: *( a ~ sample)* .
(٢) لێهاتوو بە ڕەووشت؛ زۆر چاک: *( a ~ teacher)* .
(٣) پاک؛ پاکژ. (٤) سایەقە؛ خۆش (ئاووهەوا).
(٥) وورد؛ بچووک: *( ~ sand)* .
(٦) باریک: *( ~ thread)* .
(٧) تیژ: *( a knife with a ~ edge)* .
(٨) وورد (جیاوازی، تێبینی): *( ~ distinctions)* .
(٩) ناسک. (١٠) جوان؛ جوانکیلە.
***adv.*** زۆر باش؛ زۆر چاک.
***v.t. & v.i.*** (١) پاکردنەوە؛ پاکبوونەوە؛ پاکژکردن.
(٢) ووردکردن؛ ناسک بوون.

**fine** (fīn), ***n.*** پێ بژاردن؛ پێ بژێری؛ سزا (پارە).
***v.t.*** پێ بژاردن؛ سزا لێ سەندن (پارە).

**in fine,** (١) لە ئەنجامدا؛ لە کۆتاییدا. (٢) بە کورتی.

**fine arts,** هونەرە جوانەکان.

**finery** (fīn′ẽr-i), ***n.*** جل وبەرگ و گەوهەری جوان و ڕازێنەرەوە؛
شتومەکی ڕازاندنەوە.

**finesse** (fi-nes′), ***n.*** (١) کارامەیی؛ ووردی (لە کارکردندا).
(٢) ناسکی (ڕەووشت و کارکردن). (٣) فێڵبازێتی و زیرەکی و زۆلێتی.

**finger** (fiŋ′gẽr), ***n.*** (١) پەنجە؛ ئەموست؛ ئەنگوست.
(٢) شتێک کە لە پەنجە بکات لە شێوەو بەکارهێنانداا.
(٣) پێوانەیەکە کە بریتییە لە پانایی پەنجە یا درێژی پەنجەی ناوەڕاست.
(٤) زمانەی مەکینە یا ئامێرێک.
***v.t.*** (١) پەنجەلێدان؛ دەستکاری کردن. (٢) دزین؛ بردن.
(٣) لێدانی ئامێرێکی مۆسیقایی بە پەنجە.

**burn one's fingers,** خۆ تووشی سەرئێشە کردن؛ دەست داخ بوون؛
پەنجەی خۆ داخ کردن یا سووتاندن.

**have a finger in the pie,** (١) بەشداری کردن؛ یارمەتیدان.
(٢) خۆتێهەڵقورتاندن؛ پەنجە خستنە کارێکەوە.

**put one's finger on,** پەنجە خستنەسەر گیروگرفتێک؛ دیاردەکردن؛
دەست خستنەسەر (گیروگرفت)؛ ناونووس کردن.

**twist ( or turn ) around one's little finger,** چی بوێت پێی–

دەكات' كردن بە دەسكەلای خۆ

**finger mark,** شوێن پەنجە

**finger-nail** (fiŋ′gẽr-nāl′), *n.* نینۆك

**finger-print** (fiŋ′gẽr-print′), *n.* پەنجەگرتن؛ شەقلی پەنجە.

*v.t.* پەنجەمۆر گرتن؛ پەنجەگرتن.

**finger tip,** (١) نووکی پەنجە؛ سەری پەنجە.
(٢) کیفی پاراستنی سەری پەنجە.

**have at one's finger tips,** (١) ئامادەبوون؛ لەبەر دەستدا بوون بۆ یەکسەری بەکارهێنان. (٢) باش زانین.

**finical** (fin′i-k'l), *adj.* = finicky.

**finicky** (fin′i-ki), *adj.* بەقیزوبێز؛ بە هیچ ڕازی نەبوو (بەتایبەتی خواردەمەنی).

**finis** (fī′nis), *n.* کۆتایی (پەرتووك، چیرۆك)؛ پایان.

**finish** (fin′ish), *v.t.* (١) تەواوکردن؛ کۆتایی پێ هێنان؛ بڕینەوە؛ بڕاندنەوە (٢) هێنانەدی؛ بە ئەنجام گەیاندن؛ تەواوکردن.
(٣) هیچ نەهێشتنەوە؛ تەواوکردن؛ گسك لێدان.
(٤) پەرداخ کردن؛ زۆر چاك کردن. (٥) [Colloq.]، کوشتن؛ نەهێشتن.
(٦) [Colloq.]. بێ بایەخ کردن.

*v.i.* تەواوبوون؛ دوایی هاتن؛ کۆتایی هاتن؛ نەمان.

*n.* (١) کۆتایی؛ دوایی. (٢) بۆیە. (٣) تەواوی؛ بێگەردی.
(٤) چۆنێتی تەواوکردن
(٥) چۆنێتی سافولووس کردنی ڕووی مێزوکورسی.
(٦) ئاسکیو ووردی (ڕەووشت، دووان... هتد).

**finish off,** (١) تەواوکردن؛ کۆتایی پێ هێنان؛ دوایی پێ هێنان.
(٢) کوشتن؛ نەهێشتن.

**finish up,** (١) تەواوکردن (کار). (٢) هیچ نەهێشتنەوە.

**finish with,** (١) تەواوکردن؛ دوایی پێ هێنان. (٢) پەیوەندی لەگەڵ بڕین.

**finished** (fin′isht), *adj.* (١) تەواوبوو؛ تەواو
(٢) تەواوکراو؛ بە ئەنجام گەیشتوو. (٣) زۆر باش؛ پوختە؛ بێگەرد؛ نایاب.
(٤) سافولووس کراو (مێزوکورسی).
(٥) بێ بایەخ؛ بایەخ نەماو؛ بێ کەڵك؛ کەڵك نەماو.

**finite** (fī′nīt), *adj.* (١) سنووردار؛ دوایی دێت؛ بە ئەندازە؛ دیاریکراو.
(٢) کرداری سنووردار (ڕێزمان).

*n.* شتێکی سنووردار یا بە ئەندازە.

**finitude** (fin′ə-tōōd′, fī′nə-tūd′), *n.* سنوورداریتی؛ بە ئەندازەیی.

**fink** (fiŋk), *n.* [Slang], (١) سووسە؛ سیخوڕ؛ مان گرتن شکێن (کرێکار).
(٢) کەسێکی بێ نرخو هیچوپووچو نالەبار.

**finnicky** (fin′i-ki), *adj.* = finicky.

**fir** (fũr), *n.* (١) سنەوبەر؛ درەختی سنەوبەر. (٢) دارو تەختەی سنەوبەر.

**fire** (fīr), *n.* (١) ئاگر (٢) جۆشوخرۆش؛ سۆزی بەهێز.
(٣) تەقە؛ تەقاندن (تفەنگ، تۆپ).

*v.t.* (١) سووتاندن؛ داگیرساندن. (٢) کڵدان (گۆزەودیزە).
(٣) بە ئاگر ووشك کردنەوە. (٤) بە ئاگر ڕووناك کردنەوە.
(٥) هێنانە جۆشوخرۆش. (٦) تەقاندن (تفەنگ، تۆپ).
(٧) [Colloq.]. تێکرتن؛ ئاراستەکردن بە توندی: ***(to ~ questions at)*** .
(٨) [Colloq.]. دەرکردن لە کار: ***(to ~ someone from his job)*** .

*v.i.* (١) سووتان؛ گڕ تێ بەربوون؛ ئاگر تێ بەربوون. (٢) هاتنە جۆشوخرۆش.
(٢) تەقاندن (تفەنگ، دەمانچە)؛ تەقین.

**catch fire,** ئاگر گرتن.

**fire away,** [Colloq.], دەستپێکردن (بەتایبەتی بە دووان یا پرسیارکردن).

**fire up,** (١) ئاگرکردنەوە (لە زۆپا، ئاگردان، یا فڕندا)؛ ئاگر داگیرساندن.
(٢) لەپڕ تووڕەبوون.

**go through fire and water,** تووشی ناخۆشی بوون.

**miss fire,** (١) نەتەقین (تفەنگ). (٢) ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن (لە کارێکدا).

**on fire,** (١) دەسووتێت؛ ئاگری تێ بەربووە.
(٢) پڕ لە جۆشوخرۆش؛ هاتووەتە جۆش.

**open fire,** (١) تەقەلێکردن؛ دەست بە تەقە کردن. (٢) دەستپێکردن.

**play with fire,** یاری بە ئاگر کردن؛ شتێکی مەترسیدار کردن.

**set fire to,** ئاگر تێ بەردان؛ ئاگر پێوەنان؛ سووتاندن.

**set on fire,** (١) ئاگر تێ بەردان؛ ئاگر پێوەنان؛ سووتاندن.
(٢) هێنانە جۆش؛ هەست جووڵاندن.

**under fire,** (١) تەقەی لێ دەکرێت؛ ئاگرباران دەکرێت؛ لەژێر هێرشی دوژمندایە. (٢) ڕەخنە لێ گیراو؛ سەرزەنشت کراو.

**fire alarm,** زەنگی ئاگر؛ زەنگی ڕاپەڕاندن لە ئاگر بەربوونەوەدا.

**fire-arm** (fīr′ärm′), *n.* چەکی ئاگرین (تفەنگ، دەمانچە).

**fire-ball** (fīr′bôl′), *n.* (١) هەورەتریشقە. (٢) ئەستێرەی کشاو.
(٣) چەکێکی پڕ تەقەمەنی وەك تۆپ.

**fire-bird** (fīr′bũrd′), *n.* باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە.

**fire-brand** (fīr′brand′), *n.* (١) بزوتك؛ شاپلیتە.
(٢) شۆڕشگێڕ؛ خەڵك هاندەر بۆ شۆڕش.

**fire-break** (fīr′brāk′), *n.* ئاگربڕ؛ ناوچەیەك کە پاك دەکرێتەوە بۆ ئاگربڕکردن.

**fire-bug** (fīr′bug′), *n.* [Colloq.], بە دەسەنقەست ئاگر بەردەرەوە؛ ئاگر نێرەوە.

**firecracker** (fīr′krak′ẽr), *n.* دەمەرقاچان؛ تەرەقە.

**fire department,** دەستگای ئاگرکوژاندنەوە (کە بەڕێوەبەرایەتییەکی شارەوانییە).

**fire engine,** لۆری ئاگرکوژاندنەوە.

**fire escape,** ڕێی دەربازبوون لە ئاگر (بەتایبەتی لە خانوویەکدا لەکاتی ئاگر تێ بەربووندا).

**fire extinguisher,** ئامێری ئاگرکوژێنەوە؛ ئاگرکوژێنەوە (کە لوولەکێکی بچووکە ماددەی کیمیایی تێدایە).

**fire-fight** (fīr′fīt′), *n.* شەڕە تفەنگ.

**fire-fighter** (fīr′fīt′ẽr), *n. Also* fire fighter, ئاگرکوژێنەوە (مرۆڤ)؛ ئاگرکوژێنەرەوە

**fire-fly** (fīr′flī′), *n.* گولەئەستێرە.

**fire insurance,** بیمەی ئاگر.

**fireman** (fīr′mən), *n.* (١) ئاگرکوژێنەوە (مرۆڤ)؛ ئاگرکوژێنەرەوە.
(٢) لێپرسراوی ئاگر (لە فڕنێك یا شەمەندەفەرێکدا).

**fire-place** (fīr′plās′), *n.* ئاگردان.

**fire-proof** (fīr′prōōf′), *adj.* ئاگرنەگر؛ دژئاگر؛ ئاگربڕ.

**fireside** (fīr′sīd′), *n.* (١) گوێ ئاگردان؛ گوێ ئاگر. (٢) ماڵ.
(٣) ژیانی ناوماڵ؛ ژیانی خێزانی.

*adj.* تایبەتی بە گوێ ئاگردان یا ژیانی خێزانی.

**fire station,** ئیستگەی ئاگرکوژاندنەوە.

**firestone** (fīr′stōn′), *n.* (١) بەردە ئەستێ.
(٢) بەردێکە کە بەرهەڵستی گەرمای زۆر دەکات.

**fire-wood** (fīr′wood′), *n.* داری سووتەمەنی؛ دار گزرە؛ داری سووتاندن.

**fire-works** (fīr′wũrks′), *n.pl.* فیشەکە شێتە؛ ئاگربازی.

**firing** (fīr′iŋ), *n.* (١) سوورکردنەوەی گۆزەودیزە. (٢) ئاگر خۆش کردن.
(٣) فیشەکە شێتە تەقاندن. (٤) سووتەمەنی.

**firing line,** (١) هێڵی تەقە. (٢) پێشەنگی لەشکر (لە جەنگدا).
(٣) ڕیزی پێشەوە؛ ڕیزی یەکەم.

**firing pin,** بزماری تەقە (لە چەکی ئاگریندا).

**firing squad ( or party ),** دەستەی تەقەکەر (دەستەیەك سەربازن کە بە تفەنگ کەسێك دەکوژن لەسەر فەرمانی دادگا یا تەقە بەسەر گۆڕی مردوویەکدا دەکەن لەکاتی ناشتنیدا بۆ ڕێزلێگرتنی).

**firm** (fũrm), *adj.* (١) پتەو؛ قایم. (٢) توندوتۆڵ؛ ڕەق؛ تونگ.

(٣) بەردەوام و بەهێزەوە: *(a ~ pressure)*.
(٤) چەسپیو؛ نەگۆڕ؛ پتەو: *(a ~ faith)*.
(٥) بەزەبر؛ توند: *(a ~ command)*.
(٦) مسۆگەر؛ براوە: *(a ~ contract)*.
(٧) نەگۆڕ؛ چەسپاو *(~ prices)*
*v.t. & v.i.* پتەوکردن؛ قایم کردن؛ چەسپاندن؛ پتەوبوون؛ قایم بوون؛ چەسپین؛ تونگ بوون.
**stand firm,** نەگۆڕان؛ نەحوولان؛ سووربوون لەسەر
**firm** (fŭrm), *n.* کۆمپانی؛ بەشگە؛ دەستگای بازرگانی.
**firmament** (fŭr′mə-mənt), *n.* ئاسمان؛ گەردوون.
**first** (fŭrst), *adj.* یەکەم؛ یەکەمین.
*adv.* (١) یەکەم؛ یەکەمین (٢) بۆ یەکەم جار. (٣) لە پێشتردا؛ باشتر.
*n.* (١) یەکەم؛ یەکەمین (٢) یەکەم ڕۆژی مانگ. (٣) یەکەم ساڵی چەرخێک.
(٤) سەرەتا. (٥) *(pl.)*، نایابترین؛ باشترین. (٦) براوە.
(٧) گێری یەک (ئوتومبیل)
**first of all,** لەپێش هەمووشتێکدا؛ پێشەکی.
**in the first place,** لەپێش هەمووشتێکدا؛ بەرلە هەمووشتێک؛ یەکەم.
**first-aid** (fŭrst′ād′), *adj.* تایبەتی بە فریاکەوتنی سەرەتایی.
**first aid,** فریاکەوتنی سەرەتایی.
**first-born** (fŭrst′bôrn′), *adj.* نۆبەرە
*n.* منداڵی نۆبەرە
**first-class** (fŭrst′klas′, fŭrst′kläs′), *adj.* (١) نمرە یەک؛ باشترین؛ نایابترین. (٢) هی نمرە یەک: *(a ~ ship)*.
(٣) هی پۆستەی نمرە یەک، واتە خێرا.
*adv.* (١) بە باشترین؛ بە نمرە یەک. (٢) بە پۆستەی نمرە یەک، واتە خێرا.
**first cousin,** ئامۆزا؛ خاڵۆزا؛ پورزا
**first finger,** پەنجەی شایەتمان.
**first floor,** (١) نهۆمی یەکەم؛ قاتی یەکەم.
(٢) نهۆمی دووەم (لە ئەوروپادا).
**first fruits,** (١) نۆبەرە. (٢) یەکەم ئەنجام.
**first-hand** (fŭrst′hand′), *adj. & adv.* لە سەرچاوەوە؛ ڕاستەوخۆ؛ یەکسەری:
*(~ information, knowledge, experience, etc.)*
**first lady,** ژنی سەرکۆماری ئەمەریکا
**first lieutenant,** ئەفسەری دوو ئەستێرە؛ ملازمی یەکەم.
**first-ling** (fŭrst′liŋ), *n.* (١) نۆبەرە. (٢) بەچکەی نۆبەرە.
**firstly** (fŭrst′li), *adv.* یەکەم؛ یەکەمین؛ لەپێش هەمووشتێکدا.
**first mate,** یەکەم ئەفسەری کەشتی (پلەیەک لەخوار کاپتنەوە).
**first officer,** = first mate.
**first person,** ڕێناوی یەکەم، واتە دوێنەر وەک: ( I, we ) (ڕێزمان).
**first rate** (fŭrst′rāt′), *adj.* نمرە یەک؛ یەکەمین؛ باشترین؛ زۆر نایاب
*adv.* [Colloq.], نمرە یەک؛ زۆر باش؛ زۆر نایاب.
**fiscal** (fis′k′l), *adj.* (١) تایبەتی بە خەزێنەی میری یا دەسکەوت.
(٢) دارایی
**fiscal year,** ساڵی دارایی.
**fish** (fish), *n.* (١) ماسی. (٢) هەرچ گیاندارێکی ئاوی. (٣) گۆشتی ماسی.
(٤) [Colloq.]، کەسێکی ساویلکە یا بێ هەست.
*v.i.* (١) ماسی گرتن؛ ڕاوەماسی کردن. (٢) بە فرووفێڵ شتێک دەسکەوتن.
*v.t.* (١) ماسی تێدا گرتن؛ ڕاوەماسی تێدا کردن:
*(We ~ed the stream.)*
(٢) لێ دەرهێنان؛ دۆزینەوە و دەرهێنان:
*(He ~ed a coin out of his pocket.)*
(٣) لەنگەر هەڵبڕین.
*adj.* تایبەتی بە ماسی یا ماسی گرتن.

**drink like a fish,** زۆر خواردنەوە.
**fish for,** بۆ گەڕان؛ هەوڵی دەسکەوتن دان (بەتایبەتی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ یا فێڵبازانە).
**fish in troubled waters,** لە ئاوی لێڵدا ڕاوەماسی کردن، واتە هەل پەرستن لە کاتێکی پشێویدا بۆ دەسکەوتنی شتێک بە نارەوایی.
**fish out,** ماسی لێ بڕین ( لە دەریاچەیەک).
**like a fish out of water,** لە دەرەوەی شوێنی سروشتی خۆدا بوون (وەک ماسییەک کە لەناو ئاودا نەبێت).
**other fish to fry,** جێبەجێکردنی کاری تر بە دەستەوە بوون؛ هەڵی تریش هەیە نەک هەر ئەمە.
**fish and chips,** ماسی و پەتاتەی سوورەوەکراو (خواردنێکی ئینگلیزییە).
**fish-bowl** (fish′bōl′), *n.* دەفرێکی شووشەیە ماسی بچووکی تێدا بەخێودەکرێت لەناوماڵدا.
**fisher** (fish′ẽr), *n.* (١) ماسیگر.
(٢) بەلەمی ماسیگر.
**fisherman** (fish′ẽr-mən), *n.* (١) ماسیگر.
(٢) کەشتی ماسی گرتن.
**fishery** (fish′ẽr-i), *n.* (١) گرتن و هەڵگرتن و فرۆشتنی ماسی و گیانداری ئاوی تر. (٢) شوێنی ڕاوەماسی کردن.
(٣) مافی ماسی گرتن (لە شوێن و کاتی تایبەتیدا).
(٤) شوێنی ماسی پەروەردەکردن.
**fish-hook** (fish′hook′), *n.* قولاپی ماسی گرتن.
**fishing** (fish′iŋ), *n.* (١) ڕاوەماسی؛ ماسی گرتن.
(٢) شوێنی ڕاوەماسی؛ شوێنی ماسی گرتن.
**fishing rod,** داری ڕاوەماسی.
**fish-monger** (fish′muŋ′gẽr), *n.* ماسی فرۆش.
**fish pole,** = fishing rod.
**fish-pond** (fish′pond′), *n.* ئەستێرکی ماسی پەروەردەکردن؛ حەوزە ماسی.
**fishy** (fish′i), *adj.* (١) ماسییانە؛ وەک ماسی.
(٢) بۆنی ماسی لێ دێت؛ بۆگەن.
(٣) بێ هەست و بێ ڕەنگ؛ سارد: *(a ~ stare)*.
(٤) [Colloq.]، جێی گومانە (وتە، چیرۆک، دەنگوباس)؛ جێی بڕوا نییە.
-fishiness *(n.)*.
**fission** (fish′ən), *n.* (١) شەق بردن؛ کەرت بوون؛ درز بردن؛ لەت بوون.
(٢) دوو کەرت بوون (زاووزێیەکی بێ جووت بوونە بریتییە لە بە دوو کەرت بوونی گیاندارێک یا ڕووەکێک). (٣) کەرت بوونی ئەتۆمی (فیزیا).
**fissure** (fish′ẽr), *n.* (١) درز؛ قلیش.
(٢) شەق بردن؛ پارچە پارچە بوون؛ کەرت بوون.
(٣) درزی نێوان بەشەکانی ئەندامێکی لەش (وەک لە مێشکدا).
*v.t. & v.i.* شەق پێ بردن؛ کەرت کردن؛ پارچە پارچە کردن؛ شەق بردن؛ کەرت بوون؛ پارچە پارچە بوون.
**fist** (fist), *n.* (١) مستەکۆڵە. (٢) [Colloq.]، (ا) دەست. (ب) دەسخەت.
*v.t.* مستەکۆڵە لێدان یا پیادان.
**fistful** (fist′fool), *n.* چنگێک؛ پڕ چنگێک.
**fistula** (fis′choo-lə), *n.* (١) بۆری. (٢) ناسۆر؛ برین.
**fit** (fit), *v.t.* (١) لەگەڵ گونجان؛ شیان: *(His actions ~ his words.)*
(٢) پێ کردن؛ بەقەدکردن؛ بە پێ کردن؛ بەقەدبوون: *(The coat ~s him.)*
(٣) گۆڕین و بەقەدکردن. (٤) شیاندن؛ گونجاندن
(٥) پێداکردن: *(He ~ted the key in the lock.)*
(٦) لەبەرکردن؛ پێدان.
*v.i.* (١) گونجان؛ شیان؛ باش بوون. (٢) پێ کردن؛ بەقەدکردن.
*adj.* (١) گونجاو؛ شیاو؛ چەسپ (جل و بەرگ)؛ پێ کردوو. (٢) باش.
(٣) ئامادە. (٤) تەندرووست؛ تەندرووست باش.

*n.* (١) پێ کردن؛ بەقەدبوون (٢) چوونێتی پێ کردن: *( a tight ~ )* .
(٣) شتێکی پێ کردوو؛ شتێکی گونجاو یا شیاو

**fit** (fit), ***n.*** (١) لەپڕ گرتن (کۆکە، پێکەنین... هتد)؛ هێرش:
*( a ~ of coughing, laughter, etc.)*
(٢) جموجوولێکی کاتی (٣) فێ

by fits and stars, — بە نارێک‌وپێکی

have ( or throw ) a fit, [Colloq.], — زۆر تووڕەبوون؛ شێتگیربوون

**fitch** (fich), ***n.*** = fitchew.

**fitchew** (fich′ōō), ***n.*** (١) گیاندارێکی تووک درێژە لە پشیلە گەورەترە.
(٢) فەروەی ئەم گیاندارە

**fitful** (fit′fəl), ***adj.*** نارێک‌وپێک؛ سەرەدەمی (جموجوول یا چالاکی)؛ ناوبەناو

**fitly** (fit′li), ***adv.*** (١) بە گونجاوی؛ بە چاکی؛ بە ڕێک‌وپێکی.
(٢) لەکاتی خۆیدا؛ لە کاتێکی باشدا.

**fitter** (fit′ēr), ***n.*** (١) فیتەر. ئوتومبیل؛ میکانیکی
(٢) جلدرووبەک کە جل‌وبەرگ گەورەو بچووک دەکاتەوە بۆ ئەوەی بە قەدی خاوەنەکەی بکات

**fitting** (fit′iŋ), ***adj.*** درووست؛ بەجێ؛ شیاو؛ پڕبەپڕ

*n.* (١) جل پەراوەکردن؛ جل بە بەرگرتن‌و تاقیکردنەوە.
(٢) *(pl.)* کەرەسەی ناومال یا فەرمانگە.

**five** (fīv), ***adj.*** پێنج

*n.* (١) پێنج (٢) شتێکی پێنجەکی بەتایبەتی: (ا) تیپی باسکە.
(ب) پوولی دەرمینەی پێنجەکی
(ج) [Colloq.] پارەی پێنج دۆلاری.

**five-and-dime** (fīv′′n-dīm′), ***n.*** [Colloq.].
a five-and-ten-cent store.

**five-and-ten-cent store** (fīv′′n-ten′sent′). *Also* called:
five-and-ten *and* dime store, — دووکانی شتومەکی هەرزان (کە هەر یەکەی بە پێنج یا دە فلسە).

**five-fold** (fīv′fōld′), ***adj.*** (١) پێنج ئەوەندە؛ پێنج تات.
(٢) پێنج بەشدار

**fix** (fiks), ***v.t.*** (١) چەسپاندن؛ قایم کردن (٢) خستنە مێشکەوە
(٣) ئاراستەکردن؛ چاو تێ بڕین:
*( The child ~ed his eyes on the clown.)*
(٤) ڕەق کردن
(٥) بڕینەوە؛ دانان: *( He ~ed the rent at forty dollars.)* .
(٦) گەیشتنە ئەنجام؛ بڕیاردان
(٧) ڕێکخستن؛ ڕێک‌وپێک کردن (٨) چاك کردنەوە
(٩) خۆش کردن (ئاگر).
(١٠) لێنان (چێشت)؛ ئامادەکردن (خواردەمەنی، چێشت).
(١١) [Colloq.]، بە ساختە بردنەوە (هەڵبژاردن، ملەملێ... هتد):
*( to ~ an election or a game)*
(١٢) [Colloq.]، تۆڵە لێ سەندن؛ سزادان.
(١٣) خەساندن

*v.i.* (١) چەسپان؛ چەسپین؛ قایم بوون.
(٢) [Colloq. or Dial.]، نیاز وا بوون؛ ئامادەبوون (بۆ کارێك):
*( I'm ~ing to go fishing.)*

*n.* (١) [Colloq.]، تەنگوچەڵەمە؛ گێچەڵ.
(٢) شتێك کە بە ساختە دەبرێتەوە

fix on ( or upon ), — بڕیار لەسەر دان؛ هەڵبژاردن.

fix up, [Colloq.], (١) چاك کردنەوە (شتی شکاو)
(٢) ڕێکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن (٣) ئاشتکردنەوە.
(٤) بۆ ئامادەکردن‌و ڕێك‌وپێك کردن.

**fixate** (fik′sāt), ***v.t.*** (١) چەسپاندن (٢) چاو تێ بڕین
(٣) خۆ هەڵواسین یا بەستن بە کەسێکەوە بە شێوەیەکی منداڵانە؛ تێوەئالان.

*v.i.* (١) چاو تێ بڕین؛ سەرنج پێدان.
(٢) (ا) خۆ هەڵواسین یا بەستن بە کەسێکەوە بە شێوەیەکی منداڵانە
(ب) پەرەنەسەندنی سرووشتی‌و دەروونی‌و توخمی کەسێك لە پلەیەکی تایبەتی ژیانیدا.

**fixation** (fik-sā′shən), ***n.*** (١) چاو تێ بڕین (٢) چەسپاندن
(٣) خولیا (دەربارەی کەسێك یا شتێك)؛ خووگرتن بە کەسێك یا شتێکەوە بەتایبەتی کە لە منداڵییەوە دەستی پێ کردبێت‌و بەردەوام بێت؛ حەزلێکردنێکی بێ سنوورو منداڵانە.

**fixed** (fikst), ***adj.*** (١) چەسپیو؛ قایم؛ نەجووڵاو؛ جێگیر.
(٢) بڕاوە؛ دانراو؛ نەگۆڕ: *( a ~ price)* .
(٣) سوور لەسەر؛ نەگۆڕ: *( a ~ purpose)* .
(٤) هەمیشە لە مێشکدا بوو؛ خولیایی: *( a ~ idea)* .

**fixer** (fik′sēr), ***n.*** (١) چەسپێنەر؛ جێگیرکەر.
(٢) [Colloq.]، خۆ یا کەسێکی تر ڕزگارکەر لە سزا بە بەرتیل دان‌و دەسەڵات بەکارهێنان.

**fixity** (fik′sə-ti), ***n.*** (١) چەسپاوی؛ جێگیری؛ پتەوی؛ قایمی.
(٢) شتێکی چەسپاو.

**fixture** (fiks′chēr), ***n.*** (١) شتێکی چەسپاو یا جێگیر.
(٢) *(pl.)*، شتومەکی چەسپاوی ناومال، دووکان، یا فەرمانگە.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی جێگیر لە شوێنێك یا فرمانێکدا بۆ ماوەیەکی زۆر.

**fizz, fiz** (fiz), ***n.*** (١) فیشکە (وەك هی شامپانیا یا کۆکاکۆلا کاتی کردنەوەی شووشەکە). (٢) خواردنەوەیەکی وەك شامپانیا یا کۆکاکۆلا کە فیشکەی لێوە دێت کاتی کردنەوەی شووشەکە.

*v.i.* فیشکەکردن؛ فشە لێوەهاتن

**fizzle** (fiz′′l), ***v.i.*** (١) فشە لێوەهاتن (وەك شامپانیا یا کۆکاکۆلا کاتی کردنەوەی شووشەکە). (٢) ( ~ **out** ) [Colloq.]، سەرنەکەوتن؛ پووچ بوون؛ سەرنەگرتن؛ بە هیچ نەگەیشتن.

*n.* (١) فیشکە (وەك هی شامپانیا و کۆکاکۆلا).
(٢) [Colloq.]، هەوڵدانێکی بێ سوود یا ژێرکەوتوو؛ هەوڵدانێکی پووچ

**flabbergast** (flab′ēr-gast′), ***v.t.*** [Colloq.], واق وڕماندن؛ حەپەساندن؛ سەرسووڕماندن.

**flabby** (flab′i), ***adj.*** (١) فشەڵ؛ شل‌و شێواو؛ پفەڵ؛ نەرم‌وشل:
*( ~ muscles)*
(٢) بێ هێز؛ لاواز؛ بێ تین.

-flabbily *(adv.)*; flabbiness *(n.)*.

**flaccid** (flak′sid), ***adj.*** (١) فشەڵ؛ شل‌وشێواو؛ پفەڵ؛ نەرم‌وشل:
*( ~ muscles)*
(٢) بێ هێز؛ لاواز؛ بێ تین.

-flaccidity *(n.)*.

**flag** (flag), ***n.*** (١) ئاڵا؛ بەیداخ. (٢) تووکی ڕانی کوونەپەپو و هەنۆ؛ پەڕە ووردەی هەندێ باڵندە. (٣) کلکی ئاسکە کێوی.
(٤) کلکی تووکنی هەندێ سەگ.

*v.t.* (١) بە ئاڵا ڕازاندنەوە.
(٢) بە ئاڵا ئیشارەت بۆ کردن: *( He ~ged the train.)* .
(٣) پەیام ناردن بە ئاڵا.

flag down, — ئیشارەت کردن بە ئاڵا بۆ وەستاندن:
*( to flag down a train, car, etc.)*

**flag** (flag), ***v.i.*** (١) شل‌وشێواو بوون؛ داکەوتن؛ شۆڕبوونەوە.
(٢) کزبوون؛ بێ هێز بوون؛ تین تێدا نەمان: *( His enthusiasm ~ged.)*

**flagellant** (flaj′ə-lənt, flə-jel′ənt), ***n.*** قامچی وەشێن (بەتایبەتی کەسێك کە بە قامچی خۆی دادەگرێتەوە بۆ مەبەستێکی ئاینی یا هەوەس هەڵسان‌و خۆشی لێ وەرگرتن).

*adj.* قامچی لێدەر

**flagellate** (flaj′ə-lāt′), ***v.t.*** قامچی لێدان.

*adj.* قامچیدار؛ وەك قامچی.

**flagellation** (flaj´ə-lā′shən), *n.* قامچی وەشاندن یا لێدان
(بەتایبەتی بۆ مەبەستێکی ئاینی یا هەوەس هەڵسان و خۆشی لێ وەرگرتن).
**flagellum** (flə-jel′əm), *n.* (١) قامچی (٢) تەرز (ڕووەك).
**flagman** (flag′mən), *n.* (١) ئاڵاهەڵگر
(٢) بە ئاڵا ئیشارەت نێر (بۆ وەستاندن و بەڕێکردنی شەمەندەفەر یا ئوتومبیل).
**flagon** (flag′ən), *n.* (١) مەسینە؛ شووشەی دەسکدار.
(٢) ناوەڕۆکی مەسینە یا شووشەیەکی دەسکدار.
**flagpole** (flag′pōl´), *n.* دارئاڵا
**flagrance** (flā′grəns), *n.* هەڵماڵراوی؛ ئاشکرایی و بێ شەرمی.
-**flagrancy** *(n.)*.
**flagrant** (flā′grənt), *adj.* هەڵماڵراو؛ بێ شەرم؛ ئاشکراو بێ شەرم
*( a ~ violation of the law)*
**flagstaff** (flag′staf´, flag′stäf´), *n.* – **flagpole.**
**flail** (flāl), *n.* داری گەنم و جۆ کوت؛ گەڵا کوتك.
*v.t.* (١) گەنم و جۆ کوتان بەم جۆرە دارە.
(٢) قامچی لێدان؛ بیرازکردن؛ لێدان؛ کوتان.
**flair** (flâr), *n.* بەهرە؛ توانا؛ دەستبالایی.
**flake** (flāk), *n.* (١) پرووش (بەفر)؛ کولۆ (بەفر): *( a ~ of snow)* .
(٢) تەلەزم؛ پارچە.
*v.t. & v.i.* (١) کولۆ کولۆ وەستان؛ پرووش پرووش کردن.
(٢) تەلەزم لێکردنەوە؛ پارچە لێکردنەوە.
**flaky** (flāk′i), *adj.* (١) دانە دانە وەستاو؛ کولۆ کولۆ وەستاو.
(٢) ناسك و قرچۆك. (٣) [Slang]، فشەڵ؛ پشت پێ نەبەستراو؛ هیچ و پووچ.
-**flakily** *(adv.)*; **flakiness** *(n.)*.
**flambeau** (flam′bō), *n.* (١) مەشخەل؛ بڵێسە. (٢) مۆمدان.
**flamboyant** (flam-boi′ənt), *adj.* (١) پڕ لە چوکلە و مێلی
خوار و خێچ و ڕازاوەی وەك گڕی ئاگر (خانووسازی).
(٢) ڕووناك وەك گڕی ئاگر؛ گڕاوی؛ مەشخەڵی؛ بڵێسەیی.
(٣) ڕازاوە؛ زەق
(٤) بە کەش و فش؛ خۆنوێنەر؛ خۆدەرخەر: *( a ~ person, speech, etc.)* .
-**flamboyance** *(n.)*.
**flame** (flām), *n.* (١) گڕ؛ کڵپە؛ کسپە؛ بڵێسە.
(٢) هەستێکی قووڵ و بەهێز؛ سۆز (٣) [Slang]، دڵدار
*v.i.* (١) گرگرتن؛ کڵپەکردن؛ بڵێسە سەندن.
(٢) سووربوونەوە: *( Her face ~d with anger.)* .
(٣) هاتنە جۆش؛ جۆش سەندن.
*v.t.* (١) گڕ تێ بەردان؛ ئاگر تێ بەردان. (٢) هێنانە جۆش.
**flamenco** (flä-meŋ′kō), *n.* جۆرە ئاواز و سەمایەکی ئیسپانیۆیە
**flaming** (flām′iŋ), *adj.* (١) گڕگرتوو؛ گڕاوی.
(٢) گڕ ئاسا (لە ڕووناکی و گەرمیدا). (٣) بەجۆش؛ بەسۆز؛ بەهەست.
(٤) هەڵماڵراو؛ ئاشکرا؛ زۆر دیار
**flamingo** (flə-miŋ′gō), *n.* سوورە قولنگ: باڵندەیەکی ئاوی پەمەیی
گەورەی مل و لاق درێژی دەنووك چەماوەیە.
**flammable** (flam′ə-b'l), *adj.* زوو سووت؛ زوو گڕگر.
**flange** (flanj), *n.* لێواری چەرخ یا لوولەیەك بۆ بەهێزکردن و چەسپاندن
یا پێکەوە نووساندن.
**flank** (flaŋk), *n.* (١) لاقەد؛ لاقەبرغە؛ لاتەڕاف؛ کەلەکە.
(٢) گۆشتی لاتەڕافی ئاژەل. (٣) لاتەنیشت؛ لا.
*adj.* هی لاقەبرغە یا لاتەنیشت
*v.t.* (١) لە تەنیشتەوە بوون، وەستان. یا دانیشتن؛ لە لاوە بوون.
(٢) (أ) پاراستنی لاتەنیشتی هێزێکی دۆست یا لایەنگر.
(ب) هێرش بردنە سەر هێزێکی دوژمن لە لاوە.
(ج) بە لای هێزێکی دوژمندا تێپەڕین.
*v.i.* ( ~ **on**; ~ **upon** ), لە لاوە بوون؛ لە تەنیشتەوە بوون.
**flannel** (flan′'l), *n.* (١) قوماشی خوری تەنك.
(٢) *(pl.)*، جل و بەرگی خوری بەتایبەتی پانتۆل.
(٣) [Colloq.]، *(pl.)*، فانیلە؛ جلی ژێرەوە.
**flap** (flap), *n.* (١) چمك (جل و بەرگ یا شتی تر)؛ پارچەیەکی شۆڕبووەوە
(وەك زمانەی گیرفانی چاکەت). (٢) شەقەی باڵی باڵندە؛ باڵەفڕێ.
(٣) زللە. (٤) بەشێکی جووڵاو لە باڵی فڕۆکە.
*v.t.* (١) زللە لێدان؛ پیادان (بەشێکی پان و تەخت).
(٢) شەقە لە باڵ هەڵساندن؛ باڵەفڕێ کردن:
*( The bird ~ped its wings.)*
*v.i.* (١) باڵەفڕێ کردن؛ شەقە لە باڵ هەڵسان.
(٢) شۆڕبوونەوە و شەکانەوە.
**flare** (flâr), *v.i.* (١) گڕگرتن؛ داگیرسان؛ ئاگرگرتن؛ کسپەکردن؛ هەڵچوون.
(٢) ئیشارەت دان بە شتێکی داگیرساو وەك گڕ.
*v.t.* (١) گڕ تێ بەردان؛ داگیرساندن. (٢) ئیشارەت پێدان بە شتێکی گڕاوی.
*n.* (١) گڕێکی کەم خایەن؛ کسپە. (٢) گڕێکی زۆر ڕووناکی سەردەمی بۆ
ڕووناك کردنەوەی شوێنێك. (٣) هەڵچوون (هەست، سۆز)؛ لەپڕ تووڕەبوون یا
هەڵچوون؛ شێتگیری. (٤) پێچایی یا لوولی (تەنوورە).
**flare up** ( or **out** ), (١) گڕگرتن؛ ئاگرگرتن؛ کڵپەکردن.
(٢) لەپڕ هەڵچوون (هەست)؛ لەپڕ تووڕەبوون؛ شێتگیربوون.
(٣) داگیرسان (ئاگر، شەڕ، ئاکۆکی، برین)؛ سەرهەڵدانەوە (برین، نەخۆشی
شەڕ).
**flare-up** (flâr′up´), *n.* (١) کڵپە؛ کڵپەکردن؛ گڕگرتن.
(٢) لەپڕ هەڵچوون (هەست)؛ لەپڕ تووڕەبوون.
(٣) داگیرسان (شەڕ، برین، ئاکۆکی، ئاگر)؛ سەرهەڵدانەوە.
**flash** (flash), *v.i.* (١) بریقانەوە؛ درەوشانەوە؛ شەوقدانەوە.
(٢) بریسکانەوە: *( Her eyes ~ed with anger.)* .
(٣) وەك بریسکە تێپەڕبوون: *( The automobile ~ed by.)* .
*v.t.* (١) بریقانەوە؛ درەوشانەوە. (٢) بە بریسکە ناردن (پەیام، بریسکە).
(٣) [Colloq.]، پیشاندان بۆ خۆنواندن:
*( He ~ed a roll of money.)*
*n.* (١) بریقە؛ بریقانەوە؛ درەوشانەوە.
(٢) چرکە (کات)؛ هەناسە (کات).
(٣) دەرکەوتنێکی کورت و لەپڕ (هەست، زیرەکی، وریایی... هتد):
*( a ~ of wit)*
(٤) بریسکە؛ پەیامی بە بریسکە نێردراو.
(٥) خۆنواندن؛ خۆ پیشاندان بە کەش و فش.
(٦) زمانی دز و جەردە و خەڵکی ساختەچی. (٧) لافاو هەڵسانی لەپڕ.
*adj.* (١) خۆنوێنەر؛ خۆپیشاندەر.
(٢) تایبەتی بە دز و جەردە و خەڵکی ساختەچی.
**flashback** (flash′bak´), *n.* گەڕانەوەیەکی خێراو کورت وەك
بریسکە بۆ ڕووداوی ڕابوردوو لە چیرۆکێکدا یا لە مێشکدا.
**flash bulb,** گڵۆپی ئەلەکتریکی کامێرا (کە ڕووناکییەکی کورت دەدات
بۆ وێنەگرتن).
**flash flood,** لافاوی کوتوپڕی.
**flash-light** (flash′līt´), *n.* (١) شەوقێکی بریسکەیی کز کە
هەڵدەگیرسێت و دەکوژێتەوە بۆ نیشارەتدان. (٢) گڵۆپی دەستی
(٣) شەوقی وێنەگرتن بە کامێرا.
**flashy** (flash′i), *adj.* (١) بریقەدار؛ بریسکەدار؛ زۆر ڕووناك.
(٢) خۆنوێنەر؛ بە کەشخە؛ بە کەش و فش؛ خۆبادەر.
**flask** (flask, fläsk), *n.* شووشەی مل باریك؛ شووشەی مەی؛
دەفری مل باریك.
**flat** (flat), *adj.* (١) تەخت؛ تەختانی؛ تەختایی؛ ڕێك.
(٢) پەل (دەفن). (٣) بە درێژایی؛ بە درێژی.
(٤) پان و تەنك و ساف.
(٥) بێ ئەملا و ئەولا؛ تەواو؛ بێ دوو دڵی: *( a ~ denial)* .
(٦) براوە (نرخ)؛ سەودای لەسەر ناکرێ: *( a ~ rate)* .

(٧) کز (بازاڕ): *( a ~ market)* .
(٨) بێ تام؛ ناخۆش: *( a ~ drink)* .
(٩) وشك؛ ناخۆش؛ یەك نەوا: *( a ~ existence)* .
(١٠) ناڕوون؛ نادیار: *( a ~ sound)* .
(١١) پەنچەر (تایە): *( a ~ tire)* .
(١٢) [Colloq.]، نابووت. (١٣) بێ بریقە (بۆیە، ڕەنگ).
(١٤) نزم (دەنگ، ئاوان).
***adv.*** (١) بە تەختی؛ بە پانی.
(٢) لەسەر پشت یا بەدەمەوە؛ تەخت: *( He fell ~ )* .
(٣) بە تەواوی؛ بێ کەموزیاد. (٤) بەبێ قازانج (قەرز).
(٥) نزم (ئاوان، دەنگ).
***n.*** (١) تەختایی (ڕوو، دەست، شوێن)؛ پانایی:
*( the ~ of the hand, of a sword, etc.)*
(٢) شوێنێکی تەختانی؛ زەوییەکی گەورەی تەخت.
(٣) زۆنگاوێکی نزم. (٤) شتێکی تەخت (دەفر).
(٥) تایەی پەنچەر
***v.t. & v.i.*** تەخت کردن؛ تەخت بوون؛ پان کردنەوە.
**fall flat,** بە دڵی کەس نەبوون؛ سەرنەکەوتن؛ بە ئەنجام نەگەیشتن.
**flat** (flat), ***n.*** خانوچە؛ خانووی بێ حەوشە؛ (شوقە)؛
چەند ژوورێکی پێکەوە لە هەمان نهۆمدا.
**flat-foot** (flat′foot′), ***n.*** (١) بن پێ تەخت (٢) [Slang] ، پۆلیس.
**flat-footed** (flat′foot′id), ***adj.*** (١) بن پێ تەخت.
(٢) [Slang]، پتەو؛ چەسپیو؛ نەگۆڕ.
**flatten** (flat′'n), ***v.t.*** (١) تەخت کردن؛ پان کردنەوە.
(٢) دان بە زەویدا؛ یخ دان.
***v.i.*** (١) تەخت بوون؛ پان بوونەوە.
(٢) لەسەر زەوی تەخت بوون (مرۆڤ، گیانەوەر)؛ ڕاکشان.
**flatten out,** تەخت کردن؛ تەخت بوون؛ پان کردنەوە؛ پان بوونەوە.
**flatter** (flat′ẽr), ***v.t.*** مەرایی کردن؛ پشی پشی بۆ کردن؛
بە دەورو قنگدا هاتن.
**flatter oneself,** دڵی خۆ خۆش کردن
**flattery** (flat′ẽr-i), ***n.*** مەرایی؛ مەرایی کردن؛ پشی پشی.
**flatulence** (flach′ə-ləns, flach′yoo-ləns), ***n.*** (١) باوبژەی
ئاوسك و ڕیخۆڵە. (٢) قسەی زل و هیچ و پووچ؛ کەش و فش؛ لووت بەرزی.
**flatulent** (flach′ə-lənt, flach′yoo-lənt), ***adj.*** (١) ترکەن؛
تسکەن (٢) قسەزل؛ فشەچی؛ بە کەش و فش.
**flatware** (flat′wâr′), ***n.*** دەفری نان خواردن (وەك کەوچك و چەتاڵ و
چەقۆو قاپ و .. هتد).
**flaunt** (flônt), ***v.i.*** خۆبادان بە کەش و فشەوە؛ خۆنوواندن؛
خۆدەرخستن
***v.t.*** خۆنوواندن بە کەشخەوە؛ دەرخستن بە کەش و فشەوە؛ دان بە چاودا؛
کەشخە پێوەکردن *( He ~s his wealth.)* .
**flautist** (flô′tist), ***n.*** = **flutist.**
**flavor** (flā′vẽr), ***n.*** (١) بۆن. (٢) تام.
(٣) تایبەخۆ؛ سرووشتی تایبەتی شتێك: *( the ~ of adventure)* .
***v.t.*** تام پێدان؛ ترش و خوێ پێوەکردن.
**flavorous** (flā′vẽr-əs), ***adj.*** بەتام؛ خۆش؛ تام خۆش.
**flavory** (flā′vẽr-i), ***adj.*** = **flavorous.**
**flavour** (flā′vẽr), ***n. & v.t.*** = **flavor** [British Spelling].
**flaw** (flô), ***n.*** (١) درز؛ شکاوی؛ کەموکورتی؛ ناتەواوی:
*( a ~ in the diamond)*
(٢) کەموکووڕی؛ کەموکورتی؛ هەڵە؛ ناتەواوی: *( a ~ in his character)* .
***v.t. & v.i.*** عەیبدارکردن؛ کەموکورتی هێنان؛ ناتەواو بوون.
**flaw** (flô), ***n.*** باوبۆرانێکی کورت.
**flawless** (flô′lis), ***adj.*** بێ کەموکووڕی؛ بێ گەرد؛ بێ ناتەواوی؛
بێ عەیب.
**flax** (flaks), ***n.*** (١) ڕووەکی کەتان. (٢) کەتان.
**flaxen** (flak′s'n), ***adj.*** (١) کەتان؛ لە کەتان دروستکراو. (٢) زەردباو.
**flaxseed** (flaks′sēd′, flak′sēd′), ***n.*** تۆوکەتان.
**flaxy** (flak′si), ***adj.*** وەك کەتان؛ لە کەتان دەچێت؛ کەتانی.
**flay** (flā), ***v.t.*** (١) چەرم لێکردنەوە؛ کەوڵ کردن؛ بەر قامچی دان و چەرم
لێکردنەوە. (٢) بە توندوتیژی ڕەخنەلێگرتن. (٣) ڕووتکردنەوە؛ تاڵان کردن.
**flea** (flē), ***n.*** کێچ.
**fleabite** (flē′bīt′), ***n.*** (١) گازە کێچ.
(٢) شوێنی ئەم گازە کە سووردەبێتەوە. (٣) ناڕەحەتییەکی بچووك.
**fleck** (flek), ***n.*** (١) خاڵ (پێست). (٢) پرووش؛ ئەختاڵ.
(٣) پەڵە (ڕووناکی، ڕەنگ).
***v.t.*** بە خاڵ داپۆشین (پێست).
**flection** (flek′shən), ***n.*** (١) چەمینەوە؛ چەرتانەوە. (٢) پێچ.
(٣) **inflection**
**-inflectional** ***(adj.).***
**fled** (fled), *past tense and past participle of* **flee.**
**fledge** (flej), ***v.i.*** پەڕ دەرکردن؛ پەڕو باڵ کردن و دەستکردن بە فڕین.
***v.t.*** (١) بەچکە بەخێوکردن تا باڵەفڕێ بوون. (٢) تیر داپۆشین بە پەڕ.
**fledgling, fledgeling** (flej′liŋ), ***n.*** (١) باڵندەیەکی تازە باڵەفڕێ
بوو؛ بەچکە باڵندە (٢) کەسێکی گەنج و دنیا نەدیدەو چاو نەپشکوتوو؛
باڕ (مرۆڤ).
**flee** (flē), ***v.i.*** (١) ڕاکردن؛ هەڵاتن؛ دەربازبوون.
(٢) وون بوون؛ زوو تێپەڕبوون. (٣) خێرا ڕۆیشتن.
***v.t.*** لە دەست ڕاکردن؛ لێ دەربازبوون؛ خۆ لێ لادان؛ لێ ڕاکردن.
**fleece** (flēs), ***n.*** (١) بەرگن؛ خوری (کە بە مەڕەکەوە بێت یا تازە لێی
بڕرابێتەوە). (٢) بەرگنی مەڕێك. (٣) بەرگ (کە وەك بەرگنی مەڕ وابێت).
(٤) چەشنە قوماشێکی نەرم.
***v.t.*** (١) بڕینەوە (مەڕ)؛ بەرگن لێ بڕینەوە.
(٢) ڕووتکردنەوە (بە فێڵ)؛ خەڵەتاندن و پارە لێ سەندن؛ لێ دزین.
**-fleecy** ***(adj.).***
**fleet** (flēt), ***n.*** (١) گەلە کەشتی جەنگ؛ هێزی دەریایی.
(٢) گەلە کەشتی، فڕۆکە، ئوتومبیل، لۆری... هتد.
**fleet** (flēt), ***v.i.*** (١) سەرناوکەوتن؛ مەلەکردن. (٢) فڕین؛ خێرا ڕۆیشتن.
(٣) [Archaic]، لە چاو وون بوون؛ بە پەلە تێپەڕبوون.
(٤) جێگە گۆڕین.
***v.t.*** (١) [Rare] ، کات کوشتن؛ کات بردنە سەر. (٢) جێگە پێ گۆڕین.
***adj.*** خێرا؛ گورج؛ پەلە.
**fleeting** (flēt′iŋ), ***adj.*** کورت (کات)؛ کەم خایەن؛ سەردەمی؛
زوو بەسەردەچێ: *( for a ~ moment)* .•
**flesh** (flesh), ***n.*** (١) گۆشت (بەتایبەتی هی ئادەمیزاد).
(٢) گۆشتی میوەهات. (٣) گۆشتی گیاندار.
(٤) لەشی ئادەمیزاد. (٥) سرووشتی لەش و هەستی ئادەمیزاد.
(٦) هەموو مرۆڤ؛ مرۆڤایەتی. (٧) هەموو زیندەوەرێك.
(٨) ڕووکاری لەشی ئادەمیزاد. (٩) سووربا؛ ڕەنگی پێستی مرۆڤی سپی
***v.t.*** (١) گۆشت بە سەگ دان بۆ هاندانی یا بۆ ڕاوکردن.
(٢) هانی خوێن ڕشتن دان. (٣) ڕەق کردن. (٤) تیغ بە گۆشتدا کردن.
(٥) قەڵەوکردن. (٦) گۆشت لێکردنەوە؛ کەوڵ کردن.
***v.i.*** [Colloq.], قەڵەوبوون.
**flesh and blood,** لەشی ئادەمیزاد.
**in the flesh,** (١) بە زیندووییەتی؛ زیندوو.
(٢) خۆ؛ خۆی؛ بە لەش و گیان.
**one's (own) flesh and blood,** منداڵی خۆ؛ خزمی زۆر نزیك؛
لە گۆشت و خوێنی خۆ.
**flesh-eating** (flesh′ēt′iŋ), ***adj.*** گۆشتخۆر.

**fleshy** (flesh′i), *adj.* (١) گۆشتن؛ قەڵەو
(٢) تایبەتی بە گۆشت؛ وەك گۆشت. (٣) گۆشتن (میوەمات).
**-fleshiness** *(n.).*
**flew** (flōō), *past tense of* **fly.**
**flex** (fleks), *v.t. & v.i.* (١) چەماندنەوە (قۆڵ، جومگە).
(٢) تورت کردن (ماسولکە)؛ تورت بوون؛ کرژبوون.
**flexibility** (flek′sə-bil′ə-ti), *n.* نەرمی؛ جیڕی.
**flexible** (flek′sə-b'l), *adj.* نەرم؛ جیڕ؛ بە کێشمان.
**flick** (flik), *n.* (١) شەقە (وەك هی قامچی). (٢) لێدان (وەك بە قامچی).
*v.t.* لێدان یا پیادان (وەك بە قامچی).
*v.i.* فرتەفرت کردن.
**flick** (flik), *n.* [Slang], فیلمی سینەما.
**flicker** (flik′ēr), *v.i.* (١) باڵەفڕێ کردن؛ شەقە لە باڵ هەلساندن؛
فرەفڕکردن ٢) پرتەپرت کردن (چرا، مۆم)؛ ترووسکانەوە.
*n.* (١) فرەفڕ؛ فرتەفرت. (٢) ترووسکانەوە؛ ترووسکە.
(٣) هەستێکی کەم خایەن یا زوو بەسەرچوو.
(٤) [Slang]، فیلمی سینەما.
**flier** (flī′ēr), *n.* (١) فڕۆکە؛ شتێك کە بفڕێت. (٢) فڕۆکەچی.
(٣) شەمەندەفەرێك یا پاسێك کە زوو زوو هاتوچۆ دەکات. (٤) پێ پیلکە.
(٥) [Slang]، کارێکی بازرگانی بێباکانەی وەك قومار.
(٦) [Slang]، بڵاونامەیەك کە چاپ بکرێت و بڵاوکرێتەوە بە هەمولایەکدا.
**flight** (flīt), *n.* (١) فڕین. (٢) ماوەی فڕینی یەك جاری فڕۆکە یا باڵندەیەك.
(٣) پۆل (باڵندە) *( a ~ of birds)* .
(٤) پۆلی فڕۆکەی سوپایی بە ئاسمانەوە.
(٥) فڕۆکەیەك کە هاتوچۆی ڕێكوپێك دەکات لەنێوان دوو شوێندا.
(٦) گەشتی فڕۆکە. (٧) خەیاڵ فڕین: *( a ~ of fancy)* .
(٨) چەند پێ پلیکەیەك
*v.i.* پێکەوە فڕین (باڵندە)؛ کۆچ کردن (باڵندە).
**flight** (flīt), *n.* ڕاکردن (لە مەترسی)؛ دەربازبوون؛ هەڵاتن؛ ڕەو.
**put to flight,** ڕاونان؛ ڕافڕاندن؛ هەڵفڕاندن.
**take to flight,** ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ هەڵاتن.
**flighty** (flīt′i), *adj.* (١) حولحولی؛ بێ بار. (٢) شێت؛ شێتۆکە.
**flim-flam** (flim′flam′), *n.* (١) قسەی قۆڕو هیچ‌وپووچ.
(٢) فێڵ؛ فێڵبازی
*adj.* (١) هیچ‌وپووچ؛ قۆڕ؛ بێ مانا. (٢) فێڵبازانە؛ فڕوفێڵاوی.
*v.t.* [Colloq.], فێڵ لێکردن؛ خەڵەتاندن.
**flimsy** (flim′zi), *adj.* (١) ناسك؛ بەرگەنەگر؛ شەق‌وشڕ.
(٢) هیچ‌وپووچ؛ بێ مانا (بەڵگە): *( a ~ excuse)* .
*n.* (١) کاغەزی تەنك. (٢) شتێك لەسەر کاغەزێکی وەها تەنك نووسرابێت.
**flinch** (flinch), *v.i.* سڵ کردنەوە؛ سڵەمینەوە؛ کۆکردن.
*n.* سڵ کردنەوە؛ سڵ؛ سڵەمینەوە؛ کۆکردن.
**flinder** (flin′dēr), *n.* پارچە؛ تەڵەزم.
**fling** (fliŋ), *v.t.* (١) فڕێدان؛ بە توند هەڵدان؛ تووڕدان.
(٢) جووڵاندن بە توندو لەپڕ (باڵ، لاق، سەر):
*( He flung his arms about her.)*
(٣) دەستپێکردن بەجۆشەوە: *( He flung himself into the task.)* .
(٤) خستنە ئەولاوە؛ گوێ پێ نەدان.
(٥) دانەوە (بۆن)؛ لێ هاتن (بۆن).
*v.i.* (١) بە پەلە ڕۆیشتن یا چوونەدەرەوە.
(٢) شێتانە قسەکردن؛ دەمەوەری کردن.
*n.* (١) فڕێدان. (٢) لاقرتێ.
(٣) دۆستایەتی‌یەکی نێوان ژن و پیاوێك بۆ ڕابواردن: *( They had a ~.)* .
(٤) سەمایەکی بەجۆش. (٥) [Colloq.]، هەوڵدانێك هەر بۆ تاقیکردنەوە.
**flint** (flint), *n.* (١) بەردەستێ؛ بەردە ئەستێ. (٢) شتێکی زۆر ڕەق.
**-flintly** *(adj.).*

**flip** (flip), *v.t.* (١) هەڵدانەوە (پەڕە): *( to ~ a page)* .
(٢) شێروخەت کردن؛ تەڕو ووشك کردن؛ پارە هەڵدان بە هەوادا لە شێروخەتدا
*v.i.* (١) چەقەنەلێدان؛ شەقە لە قامچی هەڵساندن.
(٢) بە جرت‌وفرت جووڵانەوە.
*n.* چەقەنە؛ شەقەی قامچی.
**flip up,** شێروخەت کردن؛ تەڕو ووشك کردن.
**flip** (flip), *adj.* [Colloq.], فشقی؛ شت بە لاقرتێ گر.
**flippancy** (flip′ən-si), *n.* (١) فشقی‌چێتی؛ بە گاڵتە دانەبەر.
(٢) کردەوەیەك یا ووتەیەکی فشقی‌چێتی‌یانە.
**flippant** (flip′ənt), *adj.* فشقی؛ فشقی‌چی؛ شت بە گاڵتە دەرەبەر؛
شت بە لاقرتێ گر.
**flipper** (flip′ēr), *n.* (١) پەڕەکەی ئەمەنگ و گیانداری دەریایی تر.
(٢) [Slang]، دەست.
**flirt** (flŭrt), *v.t.* (١) فڕێدان بە توندی.
(٢) ڕاوەشاندن: *( The bird ~ed its tail.)* .
*v.i.* (١) فرتەفرت کردن.
(٢) چاوباشقاڵی کردن؛ چاوبازی کردن؛ چاوبڕکێ کردن.
(٣) یاری پێکردن (لە مێشکدا):
*( He ~ed with the idea of quitting his job.)*
*n.* (١) فرتەفرت؛ فرەفڕ. (٢) فڕێدانی خێرا؛ هەڵدان.
(٣) چاوباز؛ چاوباشقاڵ؛ چاو لەدەر؛ کەسێکی چاوباشقاڵ.
**flirtation** (flŭr-tā′shən), *n.* چاوبازی؛ چاوباشقاڵی؛ چاوبڕکێ؛
چاوباشقاڵی کردن؛ چاو لە دەرەوەیی.
**flirtatious** (flŭr-tā′shəs), *adj.* چاوبازیکەر؛ چاوباشقاڵ؛
چاو لە دەرەوە؛ چاوبڕکێکەر.
**flirty** (flŭrt′i), *adj.* = **flirtatious.**
**flit** (flit), *v.i.* (١) پێدا تێپەڕبوون (بیر بە مێشکدا)؛ دەربازبوون.
(٢) فڕین؛ فرەفڕەکردن. (٣) [Dial.]، ڕۆیشتن. (٤) [Obs.]، گۆڕین
*n.* جووڵانەوەیەکی خێرا؛ فرەفڕ.
**flitter** (flit′ēr), *v.i. & v.t.* فرەفڕکردن.
**float** (flōt), *n.* (١) شتێك کە سەرئاو دەکەوێت یا یارمەتی سەرئاوکەوتنی
شتێکی تر دەدات. (٢) عەرەبانەیەکی ڕازاوە کە لە خۆنووانەنێکدا بەسەر
شەقامدا دەبرێت. (٣) ماڵە (بۆ ساف‌ولووس کردنی چیمەنتۆکاری و گەچکاری).
(٤) (*pl.*)، ڕیزە گڵۆپی سەر شانۆ.
*v.i.* (١) سەرئاوکەوتن.
(٢) بەسەر هەوا یا ئاودا ڕۆیشتن لەخۆوە و بێ هەوڵدان؛ سەر هەوا کەوتن.
(٣) چوون و هاتنی بێ مەبەست
*v.t.* (١) سەرئاوخستن.
(٢) ڕاگرتن بەسەر ئاوەوە: *( enough water to ~ a ship)* .
(٣) بە ئاو داپۆشین؛ نوقم کردن لە ئاودا.
(٤) خستنەناو بازاڕەوە.
(٥) ماڵەلێدان (چیمەنتۆ، گەچ، قوڕ)؛ ساف‌ولووس کردن بە ماڵە.
**floatage** (flōt′ij), *n.* = **flotage.**
**floatation** (flō-tā′shən), *n.* = **flotation.**
**floater** (flōt′ēr), *n.* (١) کەسێك یا شتێکی سەرئاوکەوتوو.
(٢) کەسێکە کە لە چەند شوێنێکدا دەنگ دەدات. (٣) [Colloq.]، گەڕۆك
(بەتایبەتی کرێکارێك کە هەر دەمە لە شوێنێك کار بکات).
**floating** (flōt′iŋ), *adj.* (١) سەرئاوکەوتوو.
(٢) گەڕۆك؛ ناجێگیر: *( the ~ population)* .
(٣) پارەی نەخراوە کار.
(٤) ئەندامێکی لەشی لە جێگەی خۆی ترازاو (پزیشکەوانی): *( a ~ kidney)*
**floating dock,** ئەسکەلەی سەرئاو (کە نزم دەکرێتەوە و ئاو و کەشتی
دێتە سەری و دوای ئەوە بەرز دەکرێتەوە سەر ئاو و کەشتی‌یەکەی تێدا
چاك دەکرێتەوە).
**floccus** (flok′əs), *n.* تۆپەڵێ تووکی سەر کلکی هەندێ گیاندار.

**flock** (flok), ***n.*** (١) ئاژەل: مێ گەل؛ ڕان (مەڕ، بزن)؛ پۆل (باڵندە).
(٢) کۆمەل (مرۆڤ، شت)؛ گەل؛ ژمارەیەکی زۆر (مرۆڤ، شت).
(٣) ئەندامانی کلێسەیەک. (٤) منداڵانی خێزانێک.
***v.i.*** کۆمەل بوون؛ کۆبوونەوە؛ گردبوونەوە؛ خڕبوونەوە.
**flock** (flok), ***n.*** (١) تۆپەل (خوری، قژ).
(٢) پاشەڕۆکی لۆکەو خوری کە دۆشەک و قەنەفەی پێ دەئاخنرێت.
**flog** (flog, flôg), ***v.t.*** قەلاقەکردن؛ دارکاری کردن.
**flood** (flud), ***n.*** (١) لافاو؛ لێشاو؛ لێزماو؛ ئاو هەلسان
(٢) بەرزاو (دەریا)
(٣) لێشاو *( a ~ of words)* .
(٤) [Colloq.]. شەوقهاوێژ.
(٥) [Archaic or Poetic]: (ا) ئاو؛ تەراتی. (ب) دەریا؛ دەریاچە؛ ڕووبار.
***v.t.*** (١) بە ئاو داپۆشین؛ نوقم کردن لە ئاودا.
(٢) پڕکردن؛ داپۆشین:
***( Music ~ed the room.; He was ~ed with invitations.)***
(٣) ئاو زۆر تێکردن.
***v.i.*** (١) لافاو هەلسان؛ ئاو هەلسان. (٢) فیچقەکردن.
**flood control,** لافاو دابینکردن.
**flood-gate** (flud′gāt′), ***n.*** (١) دەرگای لافاو دابینکردن (لە ئاوبەست، ڕووبار، یا خەنەقێکی ئاودا) (٢) هێزی دابینکردنی هەرشتێک:
***( the ~s of anger)***
**flood-light** (flud′līt′), ***n.*** شەوقهاوێژ.
***v.t.*** شەوق هاویشتنە سەرو ڕووناک کردنەوە
**floor** (flôr, flōr), ***n.*** (١) زەمینە (ژوور، هەیوان، هۆل).
(٢) بن؛ زەمینە (دەریا): *( the ocean ~ )* .
(٣) نهۆم؛ قات: *( She lives on the third ~ .)* .
(٤) شوێنی دانیشتنی ئەندامانی پەرلەمان لە هۆلی کۆبوونەوەدا.
(٥) مافی دوان لە پەرلەمان یا کۆڕێکدا:
***( The chairman gave him the ~ .)***
(٦) کەمترین پلە (نرخ، کرێ، ڕۆژانە، مووچە).
***v.t.*** (١) زەمینە بۆ دروستکردن (٢) دان بە زەویدا.
(٣) واق وڕمان؛ سەرسووڕماندن؛ سەر لێ شێواندن:
***( The problem ~ed us.)***
**floorage** (flôr′ij, flōr′ij), ***n.*** ڕووبەری زەمینە؛ گەورەیی زەمینە؛ ڕوو.
**flooring** (flôr′iŋ, flōr′iŋ), ***n.*** (١) زەمینەیەک
(٢) زەمینە؛ زەمینەکان. (٣) کەرەسەی زەمینە.
**floor leader,** ئەندامێکی پەرلەمان کە لێپرسراوی ئەندامانی حیزبەکەیەتی لە لێکۆلینەوەدا.
**floor plan,** نەخشەی ژوورو هۆل و پارەوی نهۆمێکی خانوویەک.
**floor show,** بەرنامەی گۆرانی و سەما کە لە کونجێکی زەمینەی چێشتخانە یا یانەیەکدا پێشکەش دەکرێت.
**floozy, floozie** (flōō′zi), ***n.*** (١) ئافرەتێکی بەرەڵا یا سووک.
(٢) ئافرەت (لەڕووی سووکییەوە).
**flop** (flop), ***v.t.*** (١) (ا) تەپە لێ هەلسان؛ شلپە لێ هەلساندن؛ خستنەخوارەوە یا فڕێدان و تەپە لێ هەلساندن. (ب) شلپە شلپ هاتن.
(٢) کەوتن و شلپە لێ هەلساندن *( He ~ped wearily into a chair.)* .
(٣) گۆڕینێکی کوتوپڕ.
(٤) [Colloq.]، سەرنەگرتن؛ سەرنەکەوتن.
(٥) [Colloq.]. نوستن.
***n.*** (١) کەوتن؛ کەوتنەخوارەوە. (٢) شلپە (لە ئەنجامی کەوتندا)؛ تەپە.
(٣) [Colloq.]، ژێرکەوتن؛ کەسێکی سەرنەکەوتوو؛ سەرنەگرتن.
(٤) [Colloq.]، جێگەی نوستن.
**flop-house** (flop′hous′), ***n.*** میوانخانەیەکی هەرزانبەها.
**floppy** (flop′i), ***adj.*** [Colloq.], (١) شلەپەتی؛ نەرم.
(٢) شۆڕو شلپەشلپکەر.

**Flora** (flôr′ə, flō′rə), ***n.*** (١) خودای گوڵان (ئەفسانەی ڕۆمان).
(٢) [F-]، ڕووەکی ناوچەیەک: *( The F~ and fauna of Africa)* .
(٣) [F-]، لێکۆلینەوەیەک دەربارەی ڕووەکی ناوچەیەک.
**floral** (flôr′əl, flō′rəl), ***adj.*** گوڵین؛ گوڵی؛ گوڵ؛ گوڵاوی.
**florescence** (flô-res′′ns, flō-res′′ns), ***n.*** (١) گوڵ کردن؛ گوڵ گرتن؛ گەشانەوە. (٢) دۆخ یا ماوەی گوڵ گرتن و گەشانەوە.
(٣) سەردەمی سەرکەوتن.
**-florescent** ***(adj.).***
**floret** (flôr′it, flō′rit), ***n.*** گوڵێکی بچووک.
**floriculture** (flôr′i-kul′chẽr, flō′ri-kul′chẽr), ***n.*** گوڵ- گوڵەباخ پەروەردەکردن.
**-floriculturist** ***(n.).***
**florid** (flôr′id, flō′rid), ***adj.*** (١) سوورەسپی (پێست)؛ سوور.
(٢) زۆر ڕازاوە؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ زەق. (٣) [Rare]، بە گوڵ ڕازاوە.
**-floridity** ***(n.).***
**floriferous** (flô-rif′ẽr-əs, flō-rif′ẽr-əs), ***adj.*** گوڵ؛ گوڵگر؛ زۆر گوڵ گرتوو
**florin** (flôr′in, flor′in), ***n.*** پارەیەکی کۆنی ئاڵتونی یا زیوی فلۆرنسی، ئینگلیزی، یا ئەورووپاییە.
**florist** (flôr′ist, flō′rist, flor′ist), ***n.*** گوڵفرۆش؛ گوڵ پەروەردەکەر.
**floss** (flôs, flos), ***n.*** (١) ئاوریشمی خاو؛ ئاوریشم.
(٢) شتێکی وەک ئاوریشم (وەک قژی گوڵە گەنمەشامی)
(٣) dental floss .
***v.t.*** ددان پاکردنەوە بە دەزووی ددان:
***( You should ~ every night.)***
**flossy** (flôs′i, flos′i), ***adj.*** (١) نەرم (وەک پەڕی باڵندە)؛ ئاوریشمی.
(٢) [Slang]، جوان؛ ڕازاوە؛ خۆدەرخەر: *( a ~ dress)* .
***n.*** (١) ئافرەتێکی خۆڕازێنەرەوەی جل جوانی سووک. (٢) سووک.
**flotage** (flō′tij), ***n.*** (١) سەرئاوکەوتن.
(٢) شتی سەرئاوکەوتوو (بەتایبەتی پیسەڕۆک).
**flotation** (flō-tā′shən), ***n.*** (١) سەرئاوکەوتن.
(٢) فرۆشتنی سەنەدی دارایی بە خستنەیە ناو بازاڕەوە.
(٣) دامەزراندن (کۆمپانیا)؛ دانان؛ دەستپێکردن.
**flotilla** (flo-til′ə), ***n.*** نیمچە گەلە کەشتی و بەلەمێک.
**flotsam** (flot′səm), ***n.*** لاشەی کەشتییەکی شکاوی سەرئاوکەوتوو یا بارەکەی.
**flounder** (floun′dẽr), ***v.i.*** (١) پەل کوتان؛ بە زەحمەت ڕۆیشتن بەناو قوڕ یا بەفردا. (٢) شلەژان؛ پەشۆکان؛ سەر لێ تێکچوون.
***n.*** (١) پەل کوتان. (٢) شلەژان؛ پەشۆکان.
**flounder** (floun′dẽr), ***n.*** جۆرێکە لە ماسی.
**flour** (flour), ***n.*** (١) ئارد. (٢) تۆز؛ شتێکی زۆر ووردە.
***v.t.*** (١) ئارد پێوەکردن؛ ئارد تێکردن. (٢) هاڕین و بێژانەوە.
**flourish** (flũr′ish), ***v.i.*** (١) پەرەسەندن؛ گەشەکردن؛ بووژانەوە؛ نەشونماکردن. (٢) لە هەرەتی گەنجی و سەرکەوتندا بوون.
(٣) خۆنواندن (بە دەست و باڵ جووڵاندنەوە).
(٤) نووسین بە شێوەیەکی زۆر ڕازاوە. (٥) زوڕنا و بۆقیە لێدان.
***v.t.*** (١) ڕازاندنەوە. (٢) شیر یا شمشێر ڕاوەشاندن.
***n.*** (١) [Rare] ، پەرەسەندن. (٢) خۆنووباندن؛ کردەوەیەکی خۆنواندنانە.
(٣) شیر ڕاوەشاندن؛ ڕاوەشاندن. (٤) نووسراوی ڕازاوە.
(٥) دەبدەبەی مۆسیقایی؛ پارچەیەک مۆسیقای ئاسادە.
**flour mill,** (١) ئاش؛ ئاشی ئارد.
(٢) مەکینەی گەنم وجۆو دانەوێڵەی تر هاڕین.
**flout** (flout), ***v.t. & v.i.*** گاڵتەپێکردن؛ بە سووک سەیرکردن؛ لاقرتێ کردن.
***n.*** گاڵتەپێکردن؛ بە سووک سەیرکردن؛ کردەوەیەکی وەها.

**flow** (flō), *v.i.* (١) ڕۆین (ئاو، شلە)؛ ئاو ڕۆیشتن.
(٢) ڕۆیشتن بە خشکەو ڕێکوپێکی: *( The crowds ~ed past.)* .
(٣) پچڕپچڕ نەبوون؛ خۆش ڕەوانی (نووسین، دووان): *( His writing ~s.)* .
(٤) هەڵقوڵان؛ هەڵقوڵان و لەبەر ڕۆیشتن.
(٥) تێ ڕژان؛ ڕژانە ئاو (ڕووبار بۆ ئاو دەریا).
(٦) شۆڕبوونەوە؛ بە شەپۆل وەستان:
*( Her hair ~ed down her back.)*
(٧) ئاو هەڵسان (دەریا).
(٨) مشە بوون؛ فرە بوون.
*v.t.* بە ئاو داپۆشین؛ بە ئاو نوقم کردن.
*n.* (١) ڕەوانی (ئاو)؛ ڕەوت؛ ڕۆیشتنی خشۆکانە (ئاو یا شلەی تر).
(٢) ڕێژەی ئەم ڕۆیشتنە. (٣) جۆگە؛ تەووژم.
(٤) بەرزاو؛ ئاو هەڵسان (دەریا).

**flower** (flou'ẽr, flour), *n.* (١) گوڵ (٢) گوڵەباخ.
(٣) نموونە؛ پوختە؛ سەرتوێژ؛ باشترین بەش.
(٤) تاف؛ هەرەت.
*v.i.* (١) گوڵ گرتن؛ گوڵ کردن؛ هاتنە گوڵ. (٢) بەرگرتن؛ هاتنەبەر.
*v.t.* بە گوڵ ڕازاندنەوە.
**in flower,** بە گوڵ؛ گوڵدار؛ گەشاوە؛ گوڵ کردوو.

**floweret** (flou'ẽr-it, flour'it), *n.* گوڵێکی بچووک

**flower girl,** (١) کچێکی گوڵفرۆش لەسەر شەقام.
(٢) کچێکی بچووک کە بە چەپکێک گوڵەوە لەگەڵ بووکدا دەبێت لەکاتی گواستنەوەدا.

**flowering** (flou'ẽriŋ, flou'riŋ), *adj.* بە گوڵ؛ گوڵدار؛ گەشاوە؛ دەم بە گوڵ.

**flower-pot** (flou'ẽr-pot', flour'pot'), *n.* ئینجانە؛ گوڵدان

**flowery** (flou'ẽr-i, flou'ri), *adj.* (١) بە گوڵ ڕازاوە؛ بە گوڵ داپۆشراو. (٢) گوڵاوی؛ گوڵی.
(٣) ڕازاوە (ووتە)؛ بە ووشەی جوان ڕازێنراوە.

**flown** (flōn), *past participle of* **fly.**

**flow sheet** (flō'shēt'), *n.* = **flow chart.**

**flu** (flōō), *n.* [Colloq.], = **influenza.**

**fluctuate** (fluk'chōō-āt'), *v.i.* (١) هەڵبەزودابەز کردن؛ بەرزونزم بوونەوە. (٢) هەمیشە گۆڕان؛ گۆڕین.
*( The cost of sugar ~s.)*
*v.t.* گۆڕین؛ بوون بە هۆی گۆڕان.
**-fluctuant** *(adj.).*

**fluctuation** (fluk'chōō-ā'shən), *n.* (١) بەرزونزم بوونەوە؛ هەڵبەزودابەز (٢) گۆڕین؛ گۆڕان.

**flue** (flōō), *n.* گولبینە

**fluency** (flōō'ən-si), *n.* (١) ڕەوت خۆشی؛ خۆش ڕەوانی؛ بە نەرمی و بە سافی ڕۆیشتن. (٢) زمانپاراوی؛ زمانڕەوانی:
*( His ~ in English helped him a lot.)*

**fluent** (flōō'ənt), *adj.* (١) خۆش ڕەوان؛ ڕەوت خۆش: *( ~ verse)* .
(٢) ڕەوان؛ زمانپاراو؛ زمانڕەوان: *( He is ~ in French.)* .

**fluently** (flōō'ənt-li), *adv.* (١) بە خۆش ڕەوانی؛ بە ڕەوت خۆشی.
(٢) بە پاراوی (زمان)؛ بە ڕەوانی؛ بە باشی (دووان بە زمانێک):
*( She speaks three languages ~ .)*

**fluff** (fluf), *n.* (١) پەڕ (٢) کۆمەڵێک شتی فشەڵ یا پفەڵ (وەک: تۆز، قژ، فەرو) (٣) هەڵە (لە خوێندنەوەدا لەسەر رادیۆ یا شانۆ).
*v.t.* (١) شیکردنەوەو پفەڵ کردن؛ فشەڵ کردن.
(٢) هەڵەکردن (لە خوێندنەوەدا لەسەر رادیۆ یا شانۆ).
*v.i.* شی بوونەوەو پفەڵ بوون؛ فشەڵ بوون.

**fluffy** (fluf'i), *adj.* پفەڵ؛ نەرموشل؛ نەرمۆڵە؛ فشەڵ.
**-fluffily** *(adv.)*; **fluffiness** *(n.).*

**fluid** (flōō'id), *adj.* (١) شل؛ شلە؛ نەرم. (٢) هی شل یا شلە.
(٣) هەمیشە لە گۆڕیندایە؛ نەمەیو؛ جێگیرنەبوو.
*n.* شتێکی شلە یا شل.
**-fluidity** *(n.).*

**fluke** (flōōk), *n.* (١) جۆرێکە لە ماسی.
(٢) جۆرە کرمێکە بەتایبەتی لە جگەری مەڕدا دەژی.

**fluke** (flōōk), *n.* (١) نووکی لولاپی لەنگەر. (٢) نووکی ڕم.
(٣) یەکێک لە دوو پەڕەکەی کلکی نەهەنگ.

**fluke** (flōōk), *n.* [Slang], (١) لێدانێک یا بۆهاتنێکی باش لە یاری بلیارددا. (٢) ڕێکەوتێکی بەختەوەر؛ بەختێکی باش و بە ڕێکەوت:
*( We won the football game by a ~ .)*
*v.i. & v.t.* بەخت گرتن؛ بەخت بردن؛ شانس هێنان.

**fluky, flukey** (flōōk'i), *adj.* [Slang], (١) بە ڕێکەوت؛ بە شانس. (٢) هەمیشە دەگۆڕێ: *( a ~ wind)* .

**flume** (flōōm), *n.* (١) جۆگەیەکی دەستکرد (بۆ گواستنەوەو هێنانە خوارەوەی بڕەدار لە شاخ و گردەوە بۆ ووزە پێدان وەک هی ئاشی کۆن).
(٢) چەمێکی تەسک کە جۆگەیەکی پێدا بڕوات.
*v.t.* دار گواستنەوە بە جۆگەیەکی دەستکردا.

**flummery** (flum'ẽr-i), *n.* (١) خواردنێکی نەرموشل (وەک: لەپە، شلە، محەللەبی... هتد). (٢) قسەی هیچوپووچ؛ مەرایی.

**flung** (fluŋ), *past tense and past participle of* **fling.**

**flunk** (fluŋk), *v.t.* [Colloq.], (١) دەرنەچوون (تاقیکردنەوە)؛ کەوتن (کۆرس، خوێندن): *( He ~ed the English Examination.)* .
(٢) دەرنەچواندن؛ خستن: *( The teacher ~ed her in the course.)* .
(٣) بوون بە هۆی دەرنەچوون یا کەوتن.
*v.i.* [Colloq.], (١) دەرنەچوون (قوتابی)؛ کەوتن. (٢) دەست هەڵگرتن.
*n.* [Colloq.], (١) دەرنەچوون؛ کەوتن (قوتابی). (٢) نمرەی دەرنەچوون.
**flunk out,** [Colloq.], (١) دەرنەچوون و وازهێنان لە قوتابخانە.
(٢) دەرنەچواندن و لە قوتابخانە دەرکردن یا قوتابخانە پێ بەجێهێشتن.

**flunkey, flunky** (fluŋ'ki), *n.* (١) بەردەست؛ خزمەتکار؛ نۆکەر.
(٢) مەرایی کەرێك.

**fluoresce** (flōō'ə-res'), *v.i.* شەوقی سپی دانەوە.

**fluorescence** (floo'ə-res''ns), *n.* شەوقی سپی ئەلەکتریك (وەك هی نیۆن).

**fluorescent** (flōō'ə-res''nt, floor-es''nt), *adj.* شەوقی سپی دەرەوە.

**fluorescent lamp,** گلۆپی سپی (کە شەوقی سپیش دەداتەوە).

**fluoride** (flōō'ə-rīd', flōō'ə-rid), *n.* فلۆرید (ئاوێتە).

**fluorine** (flōō'ə-rēn', flōō'ə-rin), *n.* فلۆرین.

**fluorite** (flōō'ə-rīt'), *n.* فلۆریت.

**fluoroscope** (floor'ə-skōp', flōō'ə-rə-skōp'), *n.* ئامێری بینینی بەشی ناوەوەی لەش بەهۆی تیشکی ئێکسەوە.

**flurry** (flūr'i), *n.* (١) بایەکی قایمی کەم خایەن؛ با؛ هەڵکردنی بایەکی قایم و کەم خایەن. (٢) کڕێوە؛ باران یا بەفربارینێکی کەم: *( snow ~ies)* .
(٣) شپرزەیی، سەر لێ تێکچوون، یا هاتنە جۆش و جموجوولێکی کوتوپڕی:
*( a ~ of activities)*
*v.t.* شپرزەکردن؛ پەشێواندن؛ سەر لێ شێواندن؛ هێنانە جۆش و جموجوول.

**flush** (flush), *v.i.* (١) پیا ڕۆیشتن و بڵاوبوونەوە بە گورجی:
*( The blood ~ed in his face.)*
(٢) ڕەنگ سوور هەڵگەڕان لە تەریقیدا یا لە تووڕەییدا؛ تەریق بوونەوە
(٣) درەوشانەوە؛ بڵێسە سەندن.
(٤) بەتاڵ بوونەوەو پاکبوونەوە بە ئاو پیاکردن.
(٥) دەرپەڕان؛ قاودان.
*v.t.* (١) بەتاڵ کردنەوەو پاککردنەوە بە ئاو پیاکردن (ئاودەستخانە).
(٢) تەریق کردنەوە؛ ڕەنگ سوور هەڵگەڕاندن. (٣) هێنانە جۆش.

(٤) قاودان؛ دەربەڕاندن. (٥) سفت کردن؛ ساف‌ولووس کردن؛ ڕێك کردن: ***( The mason ~ed the joint with mortar.)***

***n.*** (١) ئاو پیاڕۆیشتن‌و پاکبوونەوە (ئاودەستخانە).
(٢) گەورەبوون یا نەشونماکردنێکی کوتوپڕ. (٣) هاتنە جۆش‌و خرۆش.
(٤) تەڕیق بوونەوە؛ ڕەنگ سوور هەڵگەڕان. (٥) درەوشانەوە؛ بلێسەدان.
(٦) هەست بە گەرما کردن لەپڕ (کاتی تا لێ هاتن‌و بێ نوێژی).

***adj.*** (١) دەوڵەمەند؛ خۆش گوزەران. (٢) فرە؛ مشە؛ زەبەنە.
(٣) بەتین؛ بەجۆش؛ ڕەنگ ئاڵ یا سوور هەڵگەڕاو.
(٤) سفت؛ ڕێك؛ ساف ***( The door is ~ with the walls.)***.
(٥) بە تەواوی؛ یەکسەر.

***adv.*** (١) بە ڕێکی؛ بە سفت‌و سافی. (٢) بە تەواوی؛ یەکسەر.

**flush** (flush), ***n.*** فلەش: دەستێکی تایبەتی لە یاری کاغەزدا.

**fluster** (flus′tẽr), ***v.t.*** پەشۆکاندن؛ سەر لێ شێواندن؛ سەرکوێر کردن.

***v.i.*** پەشۆکان؛ سەر لێ شێوان؛ سەرکوێربوون.

***n.*** پەشۆکاوی؛ پەشۆکان؛ سەر لێ شێوان.

**flute** (flōōt), ***n.*** شمشاڵ؛ بلوێر؛ فلوت.

***v.t. & v.i.*** شمشاڵ لێدان

**fluter** (flōōt′ẽr), ***n.*** شمشاڵژەن؛ شمشاڵ لێدەر.

**flutist** (flōōt′ist), ***n. Also*** flautist, شمشاڵژەن؛ بلوێرژەن

**flutter** (flut′ẽr), ***v.i.*** (١) باڵەفڕێ کردن؛ باڵ شەکاندنەوە؛ پەلەقاژێ کردن؛ فرەفڕکردن (باڵندە) (٢) فڕین (دەمار). (٣) شەکینەوە (ئاڵا)؛ شەکانەوە.
(٤) لەرزین؛ هاتنە جۆش. (٥) جرت‌وفرت کردن.

***v.t.*** (١) شەکاندنەوە؛ فرەفڕپێکردن؛ باڵەفڕێ کردن؛ لەرزاندنەوە.
(٢) پەشێواندن؛ شپرزەکردن؛ هێنانە جۆش‌و خرۆش.

***n.*** (١) باڵەفڕێ؛ فرەفڕ؛ شەکینەوە؛ لەرزین؛ لەرینەوە.
(٢) پەشێوی؛ سەر لێ شێوان؛ جۆش‌و خرۆش؛ شپرزەیی.
(٣) دڵەکوتێ؛ دڵەفرکێ.

**fluvial** (flōō′vi-əl), ***adj.*** ڕووباری.

**flux** (fluks), ***n.*** (١) ڕۆیشتنی خشۆکانە (ئاو، شلە)؛ ڕەوانی یا ڕەوت (شلە). (٢) ئاو هەڵسان (دەریا)؛ بەرزاو؛ ئاو بەرزبوونەوە.
(٣) هەمیشە گۆڕان: ***( Fashion is always in a state of ~ .)***.
(٤) سکچوون؛ ڕەوانی. (٥) ماددەیەکە لەحیمی پێ دەکرێت.
(٦) ڕێژەی ڕەوتی شلە یا ووزە بەسەر ڕوویەکدا.

***v.t.*** (١) کان تواندنەوەو لێکدانیان (لەحیم کردن).
(٢) پاککردنەوە (پزیشکەوانی).

***v.i.*** [Archaic], (١) لەبەر ڕۆیشتن (شلە، ئاو). (٢) بەر بەرەژاکردن (شلە).

**fluxion** (fluk′shən), ***n.*** (١) ڕۆیشتنی خشۆکانە (ئاو، شلە).
(٢) هەمیشە گۆڕان (٣) لەبەر ڕۆیشتن؛ لێ هاتنە دەرەوە (شلە، پیسایی).

**fly** (flī), ***v.i.*** (١) فڕین (باڵندە، فڕۆکە)؛ بە فڕۆکە فڕین یا هاتوچۆکردن.
(٢) فڕین (فڕۆکەچی) (٣) شەکانەوە (ئاڵا)؛ شەکینەوە.
(٤) لەپڕ بزوان ***( The door flew open.)***.
(٥) فڕین (کات: ***( Time ~ies.)***. (٦) ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ هەڵاتن.
(٧) ڕاوکردن بە هەڵۆ.

***v.t.*** (١) هەڵدان بە ئاسماندا (کۆلارە)؛ فڕین: ***( to ~ a kite)***.
(٢) فڕۆکە لێخوڕین یا فڕین: ***( to ~ an airplane)***.
(٣) بەسەردا فڕین: ***( He flew the Pacific.)***.
(٤) بە فڕۆکە گواستنەوە؛ بە فڕۆکە فڕاندن یا هەڵگرتن.
(٥) دەربازبوون؛ هەڵاتن؛ ڕاکردن.

***n.*** (١) ئەو زمانەیەی زنجیر یا قۆپچەی پانتۆڵ دادەپۆشێت.
(٢) دەرگای چادر (قوماش). (٣) (ا) پانایی ئاڵایەك.
(ب) قەراغی ئاڵا (کە لەوپەڕی دارئاڵاکەوەیە). (٤) پێنچکە؛ ڕەوڕەوە.
(٥) پەڕەیەکی سپی لە سەرەتا یا کۆتایی پەرتووکێکدا.
(٦) عەرەبانەیەکی یەك ئەسپی. (٧) (*pl.*)، بنمیچی شانۆ.

**fly at,** هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.

**fly in the face of,** ڕووبەڕوو ڕەوستان؛ دژ وەستان؛ لەگەڵدا نەگونجان

**fly into,** لەپڕ هەڵچوون (هەست).

**fly off,** لە ناکاو ڕۆیشتن؛ بە پەلە ڕۆیشتن.

**let fly (at),** (١) تێگرتن؛ تەقەلێکردن؛ پیادان.
(٢) هێرش بردنە سەر بە دەم.

**fly** (flī), ***n.*** (١) مێش. (٢) شتێکی لە پەڕی پلاستیکی ڕەنگاوڕەنگ دروستکراوە لە شێوەی جانەوەردا لە ڕاوەماسیدا بەکاردەهێنرێت بۆ دان.

**fly-by-night** (flī′bi-nīt′), ***adj.*** (١) پشتی پێ نابەسترێت (لەڕووی دارایی یا بازرگانییەوە)؛ شلۆق.
(٢) جێی گومانەو سەردەمییە؛ کاتی‌و هیچ‌وپووچ.

***n.*** (١) قەرزارێك کە لە خاوەن قەرزەکانی ڕادەکات‌و بە شەو دەرباز دەبێت.
(٢) شتێکی سەردەمی‌و پشت پێ نەبەستراوو جێی گومان.

**flyer** (flī′ẽr), ***n.*** = flier.

**flying** (flī′iŋ), ***adj.*** (١) فڕندە؛ فڕۆك؛ بفڕ. (٢) خێرا.
(٣) شەکاوە (ئاڵا). (٤) کورت‌و بە پەلە: ***( a ~ trip)***.
(٥) هی فڕۆکە یا فڕۆکەوان: ***( a ~ field; a ~ suit)***.

**send flying,** جموجووڵێکی زۆر تێخستن.

**flying boat,** فڕۆکەی ئاوی.

**flying buttress,** پایەیەك کە بە هۆی تاقێکەوە دەنووسێنرێت بە دیوارێکەوە بۆ پاڵپشتی کردنی.

**flying colors,** (١) ئاڵای شەکاوە. (٢) سەرکەوتن.

**flying field,** فڕۆکەخانە.

**flying fish,** ماسی فڕندە (دەتوانێت بازد بدات بە هەوادا).

**flying machine,** فڕۆکە.

**flying saucer,** دەفری فڕیو؛ قاپی فڕندە؛ قاپی بفڕ (کە بریتییە لە دیاردەیەك لە شێوەی قاپدا مرۆڤ دیویێتی بە ئاسماندا فڕیوە).

**fly-leaf** (flī′lēf′), ***n.*** پەڕەیەکی سپی لە سەرەتا یا کۆتایی پەرتووکێکدا.

**fly net,** پەردە کوللە (کە بریتییە لە پەردەیەك مرۆڤ هەڵیدەدات بۆ خۆپاراستن لە مێش‌و مێشوولە... هتد).

**fly-paper** (flī′pā′pẽr), ***n.*** کاغەزی مێش (کە بریتییە لە تەبەقە کاغەزێکی لینج یا ژەهر پێوەکراو بۆ مێش کوشتن).

**fly sheet,** نامیلکە.

**fly-weight** (flī′wāt′), ***n.*** بۆکسبازێك کە ١١٢ پاوەن قورس بێت یا کەمتر.

**fly-wheel** (flī′hwēl′), ***n.*** ڕەوڕەوەیەکی قورسە بە مەکینەیەکەوە دەبەسترێت بۆ ڕێك‌وپێك کردنی خێرایی یا کارکردنی مەکینەکە بە بەردەوامی.

**foal** (fōl), ***n.*** جوانو ئەسپ؛ جوانومایەن؛ جوانولکە؛ جاش (کەر، هێستر).

***v.t. & v.i.*** زاین (ماین، کەر، هێستر).

**foam** (fōm), ***n.*** (١) کەف (ئاو، شەپۆل، بیرە، عەرەق).
(٢) [Poetic]، دەریا.

***v.i.*** کەف کردن

***v.t.*** کەف پێکردن.

**foam at the mouth,** زۆر تووڕەبوون؛ ئێجگار تووڕەبوون.

**foamy** (fōm′i), ***adj.*** (١) کەفاوی. (٢) لە کەف پێکهاتوو.
(٣) وەك کەف.

-foamily *(adv.)*; foaminess *(n.)*.

**fob** (fob), ***n.*** (١) گیرفانی کاتژمێر. (٢) زنجیری کاتژمێری گیرفان.
(٣) گەوهەرێك یا شتێکی جوان بەسەری زنجیرێکەوە.

**fob** (fob), ***v.t.*** [Obs.], خەڵەتاندن؛ گزی لێکردن؛ دەستبڕین.

**focalize** (fō′k'l-īz′), ***v.t. & v.i.*** (١) کۆکردنەوە لە ناوچەقدا؛ تیشکۆکردن؛ تیشکۆبوون.
(٢) ڕاگرتن لە یەك شوێن یا ئەندامدا (نەخۆشی).

-focalization *(n.)*.

**focus** (fō′kəs), ***n.*** (١) تیشکۆ. (٢) ناوجەرگە؛ ناوەڕاست؛ ناوچەق.
(٣) ئەندامێك یا بەشێکی لەش کە نەخۆشییەکی تیا ڕاگیراوە.
(٤) ناوەڕاست یا ناوچەقی بوومەلەرزەیەك.

*v.t.* (١) تیشکۆکردن . *( to ~ a camera)*
(٢) چاو تێ برین؛ ئاراستەکردن: . *( F~ your attention on study.)*
in focus, روون؛ دیار
out of focus, لێڵ؛ نادیار
**fodder** (fod'ẽr), *n.* ئالف؛ ئالیك
*v.t.* ئالف پێدان؛ ئالیك پێدان
**foe** (fō), *n.* دوژمن؛ ناحەز
**foetal** (fē't'l), *adj.* = fetal.
**foetus** (fē'təs), *n.* = fetus.
**fog** (fôg, fog), *n.* (١) تەم؛ تەموومژ
(٢) لێڵی (مێشك، بار یا دۆخ)؛ ناروونی.
*v.i.* (١) بە تەم گیران؛ بە تەم داپۆشران. (٢) لێڵ بوون؛ ناروون بوون.
*v.t.* (١) بە تەم گرتن؛ بە تەم داپۆشین. (٢) لێڵ کردن؛ تێکدان؛ ناروون کردن
(٣) شێواندن؛ سەرسام کردن
**fog bank,** تەمێکی زۆر چڕ.
**fog-bound** (fôg'bound', fog'bound'), *adj.* تەم ڕێی گرتووە (کەشتی).
**foggy** (fôg'i, fog'i), *adj.* (١) تەماوی؛ بە تەم گیراو یا داپۆشراو؛
پڕ تەم. (٢) لێڵ؛ ناروون. (٣) سەر لێ شێواو؛ پەشۆکاو؛ واق ووڕماو؛ شێواو.
**-fogginess** *(n.).*
**foghorn** (fôg'hôrn', fog'hôrn'), *n.* (١) هۆڕنی تەم (کە لەکاتی
تەمدا ئاوەناو لێ دەدرێت لە قەراغی دەریادا یا لەلایەن کەشتییەوە بۆ
ووریاکردنەوەی کەشتی و بەلەم). (٢) دەنگێکی بەرزی تیژی دەنگدەرەوە.
**fogy, fogey** (fō'gi), *n.* کەسێکی کۆنەپەرست
**foible** (foi'b'l), *n.* (١) کەموکووڕی (ڕەووشت)؛ ناتەواوییەکی بچووك
(ڕەووشت و سرووشت). (٢) بەشی بن هێزی شیر (لە ناوەڕاستەوە بۆ
نووکەکەی).
**foil** (foil), *v.t.* (١) کۆسپ خستنە ڕێ؛ ژێرخستن؛ ڕێگە پێ نەدان؛
ڕێی سەرکەوتن نەدان. *( He was ~ed in his attempt.)*
(٢) سەر لێ شێواندن (بە وونکردنی شوێن پێ یا بۆن گۆڕین بەتایبەتی لە
ڕاوکردندا).
*n.* (١) بۆن یا شوێن پێی گیاندارێك.
(٢) شیرێکی درێژی تەنکی نووك داپۆشراو (بۆ شیربازی). (٣) شیربازی.
(٤) [Archaic] ڕێ لێگرتن؛ ژێرخستن؛ ڕێی سەرکەوتن نەدان.
**foil** (foil), *n.* (١) پەرەی کانزا . *( tin ~ ; gold ~ )*
(٢) نەخشێکی وەك گەڵای پووەك (خانووسازی)
(٣) کەسێکە کە پێچەوانەی کەسێکی تر بێت لە ڕەووشت و سرووشتدا.
*v.t.* (١) بە پەرەی کانزا داپۆشین؛ پەرەی کانزا تێوە پێچان.
(٢) [Rare] بە پێچەوانەی کەسێکی تر ڕەفتارکردن.
(٣) پەنجەرە ڕازاندنەوە بە نەخشی وەك گەڵای دار (خانووسازی).
**foist** (foist), *v.t.* (١) بە دزییەوە تێخستن (مەرجێك لە ناو قونتەراتێکی
نووسراودا). (٢) ( ~ on ; ~ upon ). ساختەکردن
**fold** (fōld), *v.t.* (١) قەدکردن؛ لووول کردن؛ دانوشتاندن؛ نوشتانەوە؛
پێچانەوە. (٢) نوشتانەوە و کردن بە یەکدا. *( F~ your arms.)*
(٣) هێنانەوەیەك؛ قەدکردن: *( A bird ~s its wings.)*
(٤) گرتنەباوەش؛ باوەش پیاکردن. (٥) پێچانەوە؛ گرتنەوە.
*v.i.* (١) قەدبوون؛ نوشتانەوە؛ قەدگرتن.
(٢) [Slang] ژێرکەوتن؛ ئاشبەتاڵ لێکردن؛ داخستن:
*( The business ~ed.)*
*n.* (١) قەدکردن؛ لووول کردن؛ دانوشتاندن. (٢) توێ؛ قەد؛ لۆ.
(٣) خەتی قەدکردن.
fold up, (١) پێچانەوە؛ لوولدان؛ قەدکردن
(٢) [Slang] ژێرکەوتن؛ ئاشبەتاڵ کردن؛ داخستن.
**fold** (fōld), *n.* (١) پەچە؛ کۆز. (٢) مەڕو بزنی ناو پەچە.
(٣) (أ) ئەندامانی کڵێسەیەك. (ب) کڵێسەیەك.
(٤) کۆمەڵێکی یەك ئامانج و یەك نەوا.
*v.t.* کردنە پەچەوە (مەڕ، بزن).
**-fold** (fōld), پاشگرێکە بەمانای: کەرەت؛ ئەوەندە؛ جار:
*( tenfold, fivefold, etc.)*
**folder** (fōl'dẽr), *n.* (١) قەدکەر (مرۆڤ، ئامێر). (٢) فایل؛ ملەفە.
(٣) ئامێلکەیەکی لووول کراو یا نوشتاوە.
**foliage** (fō'li-ij), *n.* (١) گەڵای دارو درەخت؛ گەڵا بەسەرجەمی.
(٢) نەخش و نیگارێك لە شێوەی گەڵاو لق و پۆپدا.
**foliar** (fō'li-ẽr), *adj.* گەڵایی؛ تایبەتی بە گەڵا.
**foliate** (fō'li-āt'), *v.t.* (١) کردن بە پەرە یا توێی تەنکەوە.
(٢) ڕازاندنەوە بە نەقشی وەك گەڵا.
(٣) ژمارە دانان لەسەر پەرەی پەرتووکێك یا پەراوێك.
*v.i.* (١) چین چین بوون. (٢) گەڵا کردن؛ گەڵا دەرکردن.
*adj.* (١) بە گەڵا داپۆشراو. (٢) گەڵایی؛ وەك گەڵا.
**foliation** (fō'li-ā'shən), *n.* (١) گەڵا کردن؛ گەڵا دەرکردن
(٢) گەڵا پێوە بوون. (٣) تەنك کردن و پەرەپەرەکردنی کانزا.
(٤) پارچە پارچە بوون و وەك گەڵا لێهاتن.
(٥) ژمارە دانان لەسەر پەرەی پەرتووکێك (لەسەر هەموو پەرەیەك نەك یەك پەرە).
(٦) نەخش و نیگارێك لە شێوەی گەڵادا.
(٧) چۆنێتی بوونی گەڵا لە خونچەیەکدا.
**folio** (fō'li-ō', fōl'yō), *n.* (١) پەرەیەکی گەورەی یەك جار قەدکراو.
(٢) پەرتووکێك کە لە پەرەی نوشتاوەی وەها پێکهاتبێت.
(٣) پەرەی پەرتووك یا دەستنووسێك کە هەر یەك لای ژمارەی لەسەر بێت.
(٤) ژمارەی لاپەڕەی پەرتووکێك.
*adj.* یەك جار قەدکراو (پەرە).
*v.t.* ژمارە دانان لەسەر لاپەڕەی پەرتووکێك.
**folk** (fōk), *n.* (١) نەتەوە؛ گەل؛ تیرە؛ خێڵ؛ ڕەگەز؛ میللەت.
(٢) *(pl.)*، خەڵك؛ کەسان: . *( Town ~s are not like farmers.)*
*adj.* میللی؛ هی گەل؛ ڕەمەکی: . *( ~ music)*
just folks, [Dial. or Colloq.], خەڵکی سادە؛ کەسانی خاکی و بێ هەوا.
(one's) folks, [Colloq.], خزم؛ خزم و کەس و کار.
**folk dance,** هەڵپەڕکێ؛ سەمای میللی.
**folklore** (fōk'lôr', fōk'lōr'), *n.* (١) فۆلکلۆر: کەلەپووری بیروبڕواو
قسەی نەستەق و ئەفسانەو نەریت و خووی میللی. (٢) لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر.
**folklorist** (fōk'lôr'ist, fōk'lōr'ist), *n.* زانای فۆلکلۆر.
**folk music,** مۆسیقای فۆلکلۆری یا میللی.
**folk song,** گۆرانی فۆلکلۆری یا میللی.
**folksy** (fōk'si), *adj.* [Colloq.], (١) خاکی؛ سادە؛ وەك خەڵکی سادە.
(٢) دۆستانە؛ ڕووخۆش.
**folk tale,** چیرۆکی ئەفسانەیی فۆلکلۆری یا میللی؛ سەرگوروشتە.
**follicle** (fol'i-k'l), *n.* (١) کیس یا کونی بچووکی ناو پێست بۆ شتی
وەك ئارەق لێ هاتنە دەرەوە لە لەش: . *( a hair ~ )*
(٢) توێێك یا کەلوویەکی ووشکی لە یەك لاوە کراوە. (٣) قۆزاخە.
**follow** (fol'ō), *v.t.* (١) لە دواوە هاتن؛ لە دواوە ڕۆیشتن.
(٢) لەگەڵدا بوون؛ لەگەڵدا ڕۆیشتن.
(٣) شوێن کەوتن (بۆ گرتن)؛ دواکەوتن؛ ڕاوانن.
(٤) لەسەر ڕێ ڕۆیشتن؛ پەیڕەوی کردن: . *( to ~ the right road)*
(٥) جێگرتنەوە: . *( He ~ed his father as manager.)*
(٦) دوابەدوا هاتن.
(٧) لێوە پەیدابوون؛ دەرئەنجام بوون:
*( Disease often ~s malnutrition.)*
(٨) لەسەر ڕێ و شوێن ڕۆیشتن؛ چاولێکردن.
(٩) لەسەر ڕۆیشتن؛ پەیڕەوی کردن؛ بە گوێ کردن:
*( We ~ed the rules of the game.)*
(١٠) پاڵپشتی کردن (بیروڕا، ڕێبازی).

(۱۱) گوێگرتن؛ سەرنج پێدان.
(۱۲) گوێ پێدان؛ ئاگا لێ بوون: *(He ~s local politics.)* .
(۱۳) تێگەیشتن *(Do you ~ me?)*
**v.i.** (۱) لە دواوە هاتن یا ڕۆیشتن.
(۲) لەگەڵدا بوون؛ لەگەڵدا ڕۆیشتن. (۳) بوون بە هۆ.
**as follows,** بەم جۆرەی خوارەوە؛ وەك لە خوارەوە ڕوون کراوەتەوە.
**follow out,** تەواوکردن؛ بە تەواوی جێبەجێکردن؛ پەیڕەوی کردن.
**follow suit,** لەسەر ڕێ‌و شوێنی کەسێکی تر ڕۆیشتن؛ چاولێکردن.
**follow through,** بەردەوام بوون لەسەر کارێك تا تەواوکردنی؛ لەسەر ڕۆیشتن‌و تەواوکردن.
**follow up,** (۱) دووکەوتن؛ دواکەوتن‌و بەرنەدان.
(۲) تەواوکردن؛ بەجێهێنان؛ بە تەواوی جێبەجێکردن.
(۳) شوێن کەوتن (داخواست، سکالانامە)؛ هەنگاوی تازە نان بۆ پاڵپشتی کردن‌و جێبەجێکردنی کارێك. (٤) لێکۆڵینەوەی زیاتر؛ بەردەوام بوون لەسەر.
**follower** (fol′ō-ēr, fol′ə-wēr), ***n.*** (۱) پاشکۆ؛ کلك؛ دەسکەلا؛ شوێن کەوتوو (۲) چاولێکەر. (۳) بەردەست؛ خزمەتکار.
(٤) بەشێکی مەکینە کە ووزەو بزوێنی لە بەشێکی تری مەکینەکەوە بۆ دێت.
**following** (fol′ō-iŋ, fol′ə-wiŋ), ***adj.*** داهاتوو؛ خوارەوە؛ ئەمانەی خوارەوە
***n.*** کۆمەڵێك لە شوێن کەوتووان؛ دەستەیەکی پاڵپشتیکەر؛ دەستەی پاشکۆو خواردەستان.
**the following,** (۱) ئەمانەی خوارەوە؛ ئەمەی خوارەوە.
(۲) داهاتوو.
**follow-through** (fol′ō-thrōō′), ***n.*** بەردەوام بوون لەسەر کارێك تا تەواوکردنی (بەتایبەتی لێدانی تۆپ لە یاریدا).
**follow-up** (fol′ō-up′, fol′ə-wup′), ***adj.*** هی دواتر؛ ئەوەی لە پاش ئەوەی ترەوە دێت: *( ~ visits ; ~ letter)* .
***n.*** (۱) کارێك یا شتێکی پاشکۆ؛ ئەوەی لە دواترەوە دێت؛ هەنگاوی ئایندە (بۆ پاڵپشتی کردنی هەنگاوی پێشووتر).
(۲) هەنگاوی ئایندە نان (وەك نووسینی نامەیەکی تر یا سەردانی یەکێك).
**folly** (fol′i), ***n.*** (۱) گەوجێتی؛ کەرێتی؛ بێ مێشکی؛ نەزانی.
(۲) کردەوەیەك یا بڕوایەکی کەرانە. (۳) هەوڵدانێکی بێ سوودو گرانبەها.
**foment** (fō-ment′), ***v.t.*** (۱) هەنوون (لەش)؛ بە ئاوی گەرم داشتن‌و شتی گەرم لێنان (لەش). (۲) هاندان؛ بزواندن؛ ڕێ بۆ خۆش کردن:
*( to ~ rebellion)*
-fomentation *(n.)*.
**fond** (fond), ***adj.*** (۱) ساویلکە (۲) [Dial.]، شێت؛ شێتۆکە.
(۳) دڵنەرم؛ دڵ ناسك. (٤) ناسك‌و پڕ لە خۆشەویستی: *(~ caresses)* .
(۵) خۆش؛ خۆشەویست: *( my ~est wish)* .
**fond of,** خۆشویستن؛ خوایشت ویستن؛ چوونە دڵەوە:
*( to be fond of a person)*
**fondle** (fon′d'l), ***v.t.*** دەست پیاهێنان (خۆشەویستی)؛ دەست تێوەدان‌و یاری پێکردن (بۆ دەربڕینی خۆشەویستی):
*( to ~ a baby, a lover, a cat, etc.)*
**fondly** (fond′li), ***adv.*** (۱) ساویلکانە.
(۲) خۆشەویستانە؛ لەڕووی خۆشەویستییەوە.
**fon-due** (fon′dōō, fon-dōō′), ***n.*** خواردەمەنییەکی گەرمە لە پەنیری تواوەو کەرەو هێلکەو مەی پێکدێت بە نانەوە دەخورێت.
**food** (fōōd), ***n.*** (۱) خواردەمەنی؛ خۆراك؛ نان؛ نمەك؛ بژێو؛ خواردن.
(۲) خواردنێکی تایبەتی؛ خواردەمەنییەکی تایبەتی.
(۳) دان؛ شتی زاخاو دەرەوە یا بژوێن: *( ~for thought)* .
**food-stuff** (fōōd′stuf′), ***n.*** خواردەمەنی؛ خواردەمەنی خاو؛ بژێو.
**fool** (fōōl), ***n.*** (۱) کەسێکی بێ مێشك، کەر، نەزان، یا گێل.
(۲) کەسێکی قۆشمەچی یا گاڵتەبێژ (لە کۆندا لە کۆشکی پاشاکاندا ڕادەگیرا هەر بۆ ڕابواردن‌و پێکەنین).

***v.i.*** (۱) خۆ گێل کردن؛ ڕەووشتی منداڵانە یا بێ مێشکانە نواندن.
(۲) گاڵتەکردن.
***v.t.*** هەڵخەڵەتاندن؛ بە هەڵە بردن.
**be no ( or nobody's ) fool,** زۆرزان؛ زۆڵ؛ لێهاتوو؛ کەر نییە.
**fool around,** [Colloq.], (۱) کات بەفیڕۆدان؛ بە شتی هیچ‌وپووچ‌و منداڵانەوە کات بەسەر بردن. (۲) [Slang]، داوێن پیسی کردن؛ بە دزییەوە ڕابواردن (بەتایبەتی ژنی مێردداریا پیاوی ژندار)
**fool with,** [Colloq.], دەستکاری کردن؛ لاقەکردن.
**play the fool,** خۆ گێل کردن؛ خۆ لێ هەڵەکردن.
**fool** (fōōl), ***n.*** شیرینییەکە لە میوە درووست دەکرێت.
**foolery** (fōōl′ēr-i), ***n.*** (۱) کردەوە یا ڕەووشتێکی شێتانە یا کەرانە.
(۲) کەرێتی.
**foolhardy** (fōōl′här′di), ***adj.*** چاوقایم؛ سەرکێش؛ هەڵەشە؛ سەرگەرم؛ ئازاو بێ مێشك.
-foolhardily *(adv.)*; foolhardiness *(n.)*.
**foolish** (fōōl′ish), ***adj.*** (۱) بێ مێشك؛ کەر؛ نەزان؛ گەوج.
(۲) بێ مانا؛ قۆڕ.
(۳) [Archaic]، بێ نرخ؛ هیچ‌وپووچ.
**foolishness** (fōōl′ish-nis), ***n.*** (۱) بێ مێشکی؛ کەرێتی؛ نەزانی؛ گەوجی. (۲) کردەوەیەك یا شتێکی کەرانە.
**fool-proof** (fōōl′prōōf′), ***adj.*** (۱) ئەوەندە ئاسان‌و ڕێك‌و ڕەوانە کەسێکی بێ مێکیش دەزانێ کاری پێ بکات.
(۲) قەت تێ ناشکێن، خراپ نابێت، یا ژێر ناکەوێت: *( a ~ plan)* .
**foolscap** (fōōlz′kap′), ***n.*** پەڕە کاغەزی گەورە (کە پانی ۱۳ گرێ‌و درێژی ۱۷ گرێ بێت).
**fool's errand,** کردەوەیەکی بێ سوودو کەرانە.
**fool's paradise,** بەهەشتی کەران یا بێ مێشکان.
**foot** (foot), ***n.*** (۱) پێ؛ قاچ.
(۲) شتێك کە لە شوێندا وەك پێ بێت: (ا) بن، پێنچکە (مێز، کورسی).
(ب) لاخوارووی شتێك: *( the ~ of a page)* .
(ج) دامێنی شاخ؛ بناری شاخ.
(۳) لاخوارووی جێی نووستن یا گۆڕ (کە جێی قاچە).
(٤) ئەو بەشەی گۆرەوی کە قاچ دادەپۆشێت. (۵) پێ (پێوان).
(٦) پیادە (سوپا، پۆلیس). (۷) خڵتە.
(۸) خشتە (هۆنراوە)؛ دوو برگە یا زیاتری پێکەوە ووتراوی هۆنراوە:
( to be or not to be ) لە سێ خشتە یا "فووت" پێکهاتووە.
***v.i.*** (۱) سەماکردن. (۲) بە پێ ڕۆیشتن؛ پیاسەکردن.
(۳) بزوان یا بۆ پێشەوە ڕۆیشتن (کەشتی).
***v.t.*** (۱) پیا ڕۆیشتن؛ ڕاکردن لەسەر؛ سەماکردن لەسەر.
(۲) گۆرەوی لەپێکردن. (۳) کۆکردنەوەو سەرجەم دەرهێنان.
(٤) [Colloq.]، پارەدان: *( He ~ed the bill.)* .
**foot it,** [Colloq.], سەماکردن؛ بە پێ ڕۆیشتن؛ ڕاکردن.
**foot up,** کۆکردنەوەو سەرجەم دەرهێنان.
**have one foot in the grave,** [Colloq.], سەر لە گۆێی گۆڕ لەرزین؛ پیرو نەخۆش.
**on foot,** (۱) بە پێوە وەستاو. (۲) بە پێ ڕۆیشتن؛ ڕاکردن.
(۳) بەردەوام بوون؛ خەریك بوون.
**put one's best foot forward,** [Colloq.], (۱) زۆر خێرا ڕاکردن یا ڕۆیشتن. (۲) (ا) بە باشترین شێوە خۆ پیشاندان. (ب) ئەوپەڕی هەوڵدان.
**put one's foot down,** [Colloq.], لەسەر سووربوون؛ پێ دان بە زەویدا، واتە لەسەر سووربوون.
**put one's foot in it ( or one's mouth ),** [Colloq.], هەڵەکردن یا شتێکی خراپ ووتن‌و تەریق بوونەوە لە ئەنجامدا.
**-foot** (foot), پاشکۆیەکە بەمانای: پێ (پێوان– درێژی، پانی، بەرزی، قووڵی): *( six-foot)* .

**footage** (foot′ij), ***n.*** دریژی به پێ  فیلمی سینەما).
**football** (foot′bôl′), ***n.*** (١) یاری فوتبۆلێنی ئەمەریکی.
(٢) تۆپی ئەم یارییە. (٣) مەسەلەیەك، كێشەیەك، یا كەسێك كە هیچ دەستەیەك نەیگرێتە خۆی و یاری پێ بكەن وەك تۆپی شەق شەقێن.
**footboy** (foot′boi′), ***n.*** بەردەستێكی منداڵ.
**footbridge** (foot′brij′), ***n.*** پردی پیادەڕۆ
**-footer** (foot′ēr), پاشكۆیەكە بەمانای: كەسێك یا شتێكی ئەوەندە درێژ یا بەرز... هتد: *(a six-footer)* .
**footer** (foot′ēr), ***n.*** پیادە؛ پیادەڕۆ.
**footstep** (foot′step′), ***n.*** (١) هەنگاو. (٢) دەنگی شوێن پێ.
**footgear** (foot′gêr′), ***n.*** پێڵاو
**foothill** (foot′hil′), ***n.*** گردی بناری شاخ؛ گردی دامێنی شاخ.
**foothold** (foot′hōld′), ***n.*** (١) شوێن پێ؛ جێی وەستان.
(٢) جێیەكی ئاسوودەو باش بۆ پاڵپشتی.
**footing** (foot′iŋ), ***n.*** (١) بە پێ ڕۆیشتن یا گەڕان.
(٢) شوێن پێیەكی پتەو.
(٣) بنچینە؛ بناغە: *(This business must be put on a sound ~.)* .
(٤) ئاست *(to be on an equal ~ with)* .
(٥) (ا) كۆكردنەوەو سەرجەم دەرهێنان. (ب) سەرجەم.
(٦) بنی دەرپەڕیوی پایە یا دیوار.
**footless** (foot′lis), ***adj.*** (١) بێ پێ؛ بێ قاچ.
(٢) بێ بناغە؛ بێ بن؛ بێ پاڵپشت.
(٣) [Colloq.]، ناكارامە؛ لێ نەهاتوو.
**footlights** (foot′līts′), ***n.pl.*** (١) شەمقهاوێژی سەرزەمینەی شانۆ.
(٢) شانۆ؛ پیشەی ئەكتەری.
**footlocker** (foot′lok′ēr), ***n.*** باوەڵی سەرباز (كە لەبەر پێی جێی نووستنەكەیەوە دایدەنێت).
**footloose** (foot′lōōs′), ***adj.*** بەرەڵا (مرۆڤ)؛ ئازاد؛ دەتوانێت بە هەرچ لایەكدا بیەوێت بچێت.
**footman** (foot′mən), ***n.*** (١) بەردەست؛ خزمەتكار.
(٢) [Archaic]، سەربازی پیادە.
**footmark** (foot′märk′), ***n.*** شوێن پێ؛ جێ پێ.
**footnote** (foot′nōt′), ***n.*** پەراوێز؛ تێبینی پەراوێز.
***v.t.*** پەراوێز یـ تێبینی پەراوێز نووسین.
**footpath** (foot′path′, foot′päth′), ***n.*** پیادەڕێ؛ توولەڕێ؛ زەلامەڕێ؛ ڕێچكە
**footprint** (foot′print′), ***n.*** شوێن پێ؛ جێ پێ.
**footrest** (foot′rest′), ***n.*** شوێنی حەوانەوەی پێ (لە كاتی دانیشتندا یا پاڵدانەوەدا).
**foot soldier,** سەربازی پیادە
**foot-step** (foot′step′), ***n.*** (١) هەنگاو. (٢) دەنگی پێ.
(٣) شوێن پێ؛ جێ پێ. (٤) پلەی پێ پلیكانە.
**follow in (someone's) footsteps,** لەسەر ڕێ و شوێنی كەسێك ڕۆیشتن؛ چاولێكردن.
**footstone** (foot′stōn′), ***n.*** كێلی بەر پێی گۆڕ.
**footwear** (foot′wâr′), ***n.*** پێڵاو.
**footwork** (foot′wûrk′), ***n.*** شێوەی بەكارهێنانی پێ لە وەرزش و هەڵپەڕكێدا.
**fop** (fop), ***n.*** (١) كەسێكی بێ مێشك. (٢) كەسێكی زۆر تەڕپۆش؛ كەسێكە كە بە پەلەپیتكە خۆی دەتەكێنێ.
**foppery** (fop′ēr-i), ***n.*** كردەوەو جل و بەرگی كەسێكی تەڕپۆش.
**foppish** (fop′ish), ***adj.*** تایبەتی بە كەسێكی زۆر تەڕپۆش؛ كەشخەچی؛ لووت بەرزو بە پەلەپیتكە خۆتەكێنەر.
**for** (fôr; *unstressed* fēr), ***n.*** (١) لەباتی؛ لەجیاتی.
(٢) لەجێی؛ لەبریتی: *(His agent acted ~ him.)* .
(٣) بۆ؛ لەپێناوی: *(They fought ~ freedom.)* .
(٤) بە ناوی ئەوەوە؛ بۆ ڕێزلێنانی ئەو: *(The baby was named ~ his grandfather.)*
(٥) لەبەر؛ بۆ؛ بۆ ئەو ئامانجە: *(He carried a gun ~ protection.)*
(٦) بۆ (چوون بۆ شوێنێك)؛ بەرەو: *(She has just left ~ home.)*
(٧) بۆ (گەڕان بۆ شتێك)؛ بە دوادا: *(The child looked ~ his dog.)*
(٨) بۆ (كەسێك یا شتێك): *(flowers ~ a girl)* .
(٩) بۆ (شیان بۆ مەبەستێك): *(a room ~ sleeping)* .
(١٠) بە دوایدا؛ بۆ: *(The child cried ~ his mother.)* .
(١١) بۆ: *(It is cool ~ July.)* .
(١٢) لەبەر؛ بە؛ بەهۆی: *(He cried ~ pain.)*
(١٣) لەگەڵ ئەوەشدا: *(She is stupid ~ all her learning.)* .
(١٤) بۆ؛ لە بەرامبەری: *(a good day ~ every ten bad ones)*
(١٥) بە؛ بە ئەوەندە: *(He sold the house ~ $ 10000.)*
(١٦) بۆ ئەوەندە (كات، دووری یا ماوە): *(The movie lasts ~ an hour.; The road runs ~ five miles.)*
(١٧) بۆ (كات) *(I made an appointment ~ three o'clock.)* .
(١٨) [Obs.]، لەپێش.
*conj.* لەبەر؛ چونكە؛ لەبەرئەوەی.
**forage** (fôr′ij, for′ij), ***n.*** (١) ئاڵف؛ ئالیك.
(٢) بۆ ئاڵف، خواردەمەنی، یا ئازووقە گەڕان؛ بۆ لەوەڕگا گەڕان.
***v.i.*** (١) بۆ ئاڵف، خواردەمەنی، یا ئازووقە گەڕان
(٢) (~ for; ~ about)، گەڕان بە دوای شتێكی پێویستدا.
***v.t.*** (١) (ا) ئازووقە خستن؛ خواردەمەنی لێ وەرگرتن یا لێ سەندن.
(ب) تالان كردن؛ ڕووتكردنەوە. (٢) ئاڵف پێدان؛ خواردن پێدان.
(٣) ئاڵف دەسكەوتن بە بۆ گەڕان.
**for-as-much** (fôr′əz-much′), ***conj.*** ئەوەندەی؛ هەتا (پلە).
**foray** (fôr′ā, for′ā), ***v.t. & v.i.*** تالان كردن؛ ڕاوو ڕووت كردن؛ ڕووتكردنەوە.
***n.*** هێرشی تالان كردن؛ هێرشی ڕاوو ڕووت كردن؛ هێرش.
**forbade, forbad** (fēr-bad′, fôr-bad′), *past tense of-* **forbid.**
**forbear** (fôr-bâr′, fēr-bâr′), ***v.t.*** (١) نەكردن؛ خۆ ڕاگرتن (لە كردن یا ووتنی شتێك). (٢) [Archaic]، دەربڕدن؛ هەڵكردن؛ بەرگەگرتن.
***v.i.*** خۆ ڕاگرتن؛ نەكردن (كار)؛ خۆگرتن.
**forbear** (fôr′bâr′), ***n.*** = **forebear.**
**forbearance** (fôr-bâr′əns, fēr-bâr′əns), ***n.*** (١) خۆگرتن؛ خۆ ڕاگرتن؛ هەڵكردن؛ ئارام بوون (٢) ماوەی زیادە پێدان بۆ دانەوەی قەرزێك.
**forbid** (fēr-bid′, fôr-bid′), ***v.t.*** قەدەغەكردن؛ ڕێ پێ نەدان؛ نەهێشتن.
**forbiddance** (fēr-bid′′ns, fôr-bid′′ns), ***n.*** قەدەغەكردن؛ قەدەغەكراوی.
**forbidden** (fēr-bid′′n, fôr-bid′′n), ***adj.*** قەدەغەكراو؛ قەدەغە.
**forbidden fruit,** (١) بەری ئەو دارەی قەدەغە بوو لە ئادەم و حەوا كە لێی بخۆن (قورئان، ئینجیل). (٢) شتێكی ویستراوی قەدەغەكراو.
**forbidding** (fēr-bid′iŋ, fôr-bid′iŋ), ***adj.*** بە سام؛ سامناك؛ سامدار؛ ترسناك؛ بە شكۆ.
**forbore** (fôr-bôr′, fôr-bōr′), *past tense of* **forbear.**
**forborne** (fôr-bôrn′, fôr-bōrn′), *p.p. of* **forbear.**
**force** (fôrs, fōrs), ***n.*** (١) هێز؛ ووزە؛ تین. (٢) تەووژم.
(٣) زۆر؛ زۆركاری؛ زۆرەملی؛ زەبر؛ توندوتیژی.
(٤) لەنگەر (ڕەووشت)؛ قورسی: *(the ~ of character)* .
(٥) هێزی سوپایی یا دەریایی؛ نێرو.
(٦) كۆمەڵ (سەرباز، كەشتییەوان)؛ دەستە.
***v.t.*** (١) زۆرلێكردن؛ بەزۆر پێ كردن.

(٢) به زۆر سواربوون؛ بەزۆر لەگەڵدا جووت بوون.
(٣) به زۆر ڕێگەکردنەوه یا شکاندن یا داگیرکردن؛ بەسەردا دان.
(٤) به زۆر لێ سەندن: *( I ~d the gun from his hand.)* .
(٥) ناچارکردن؛ والێکردن: *( Hunger ~d him to steal.)* .
(٦) ( **~ on ; ~ upon** ). سەپاندن بەسەردا؛ بەزۆر سەپاندن بەسەردا:
*( He ~ed his attention on her.)*

**by force,** به زۆر؛ به زۆرەملێ؛ به زۆرکاری.
**in force,** (١) به هەموو هێزەوه؛ هەموو هێز.
(٢) کاری پێ دەکرێ (یاسا)؛ له کاردایه (پەیڕەو، یاسا).

**forced** (fôrst, fōrst), ***adj.*** (١) هی زۆرکاری؛ به زۆرەملێ؛ بەزۆر؛ بێگار: *( ~ labor)* .
(٢) ناسرووشتی؛ درۆ؛ دروستکراو: *( a ~ smile)* .
(٣) ناچاری *( a ~ landing)* .
**-forcedly** ***(adv.).***

**forceful** (fôrs′fəl, fōrs′fəl), ***adj.*** به زەبروزەنگ؛ بەهێز؛ بەتین؛ بەگوڕ؛ توندوتیژ؛ بەکار؛ کاریگەر: *( a ~ person, argument, etc.)* .

**forceps** (fôr′səps, fôr′seps), ***n.*** مقەستی پزیشک

**forcible** (fôr′sə-b'l, fōr′sə-b'l), ***adj.*** (١) به زۆرەملێ؛ به زۆر کراو. (٢) به زەبروزەنگ؛ بەهێز؛ توندوتیژ.

**forcibly** (fôr′sə-bli, fōr′sə-bli), ***adv.*** به زۆر؛ به زۆرەملێ؛ به زۆرکاری

**ford** (fôrd, fōrd), ***n.*** بووار؛ تەنکاو؛ تەنکایی
***v.t.*** له بووارەوه یا تەنکاوەوه پەڕینەوه.

**fordo** (fôr-dōō′), ***v.t.*** [Archaic], (١) لەناوبردن؛ نەهێشتن؛ کوشتن. (٢) ماندووکردن

**fordone** (fôr-dun′), ***adj.*** [Archaic], ماندوو؛ هیلاک

**fore** (fôr, fōr), ***adv.*** پێشەوه؛ پێشەکەی؛ لووتەکەی (کەشتی).
***adj.*** لەپێشەوه؛ له پێشەکەیدا.
***n.*** بەشی پێشەوه یا بەردەم.

**fore-** (fôr, fōr), پێشکۆیەکە بەمانای: (١) لەپێش (کات، جێگە، پلە، ڕێز): *( forecast, forenoon)* .
(٢) لەبەردەم؛ پێش. *( forearm, forehead)* .

**fore-and-aft** (fôr′'n-aft′, fōr′'n-äft′), ***adj.*** به درێژایی (کەشتی).

**fore and aft,** (١) له پێشی کەشتییەوه تا پشتەکەی.
(٢) له پێش و پاشی کەشتییەوه؛ له هەردوو سەری کەشتییەوه.

**forearm** (fôr′ärm′, fōr′ärm′), ***n.*** باسک؛ قۆڵ (نێوان ئانیشک و مەچەک).

**forearm** (fôr-ärm′, fōr-ärm′), ***v.t.*** پێشەکی چەکدارکردن؛ پێشەکی خۆ ئامادەکردن.

**forebear** (fôr′bâr′, fōr′bâr′), ***n.*** باوو باپیر

**forebode** (fôr-bōd′, fōr-bōd′), ***v.t. & v.i.*** (١) نیشانەی ئەوە بوون (بەتایبەتی شتێك یا ڕووداوێکی بەدووم).
(٢) دڵ خەبەردان یا پێشبینی کردنی ڕووداوێکی بەدووم و ناخۆش.

**foreboding** (fôr-bōd′iŋ, fōr-bōd′iŋ), ***n.*** نیشانەی ڕووداوێکی بەدووم یا کارەساتی

**forecast** (fôr′kast′, fōr′käst′), ***v.t.*** (١) پێشەکی هەڵسەنگاندن.
(٢) پێشبینین (ئاو وهەوا، ڕووداوی تر).
***n.*** پێشبینی *( weather ~ )* .

**forecastle** (fōk′s'l, fôr′kas′'l), ***n.*** (١) بەشی پێشەوەی سەرپشتی کەشتی. (٢) بەشی پێشەوەی کەشتییەکی بازرگانی (شوێنی حەوانەوەی کەشتیەوانەکان

**foreclose** (fôr-klōz′, fōr-klōz′), ***v.t.*** (١) ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتن؛ قەدەغەکردن (٢) ڕێ نەدان یا قەدەغەکردنی دەرهێنانەوەی بارمتەیەك یا شتێکی ڕەهن کراو لەبەر نەدانی قیستەکان له کاتی خۆیدا.
(٣) پێشەکی بڕینەوەی مەسەلەیەك.

**foreclosure** (fôr-klō′zhēr), ***n.*** (١) قەدەغەلێکردنی دەرهێنانەوەی شتێکی ڕەهن کراو (لەبەر نەدانی قیستەکان له کاتی خۆیدا).
(٢) خانوو سەندنەوه له خاوەنەکەی لەلایەن بانقەوه لەبەر نەدانی مانگانەکانی.

**forefather** (fôr′fä′*th*ēr, fōr′fä′*th*ēr), ***n.*** باوو باپیر؛ باپیر؛ داپیر.

**forefinger** (fôr′fiŋ′gēr, fōr′fiŋ′gēr), ***n.*** پەنجەی شایەتمان؛ دۆشاومژە.

**forefoot** (fôr′foot′), ***n.*** سمی وولاخ؛ سمی گیاندارێکی چوارپێ.

**forefront** (fôr′frunt′, fōr′frunt′), ***n.*** (١) بەردەم؛ هەره پێشەوه؛ پێشی پێشەوه؛ پێشەنگ.
(٢) ناوجەرگەی کار یا شت؛ شوێنی هەره گرنگ.

**forego** (fôr-gō′, fōr-gō′), ***v.t.*** (١) له پێشدا بوون یا هاتن (کات، جێ، پله). (٢) دەست لێ هەڵگرتن (ماف)؛ واز لێ هێنان.

**foregoing** (fôr′gō′iŋ, fōr′gō′iŋ), ***adj.*** پێشوو؛ پێشووتر.
**the foregoing,** ئەوەی پێشوو (ووته، نووسراو، تێبینی)؛ ئەوەی لەوەوپێشتر ووتراوه یا نووسراوه.

**foregone** (fôr-gôn′, fōr′gon), ***adj.*** (١) پێشوو؛ پێشووتر؛ ڕابوردوو. (٢) پێشەکی بڕیاردراو یا زانراو؛ دیار؛ مسۆگەر؛ بێ گومان:
*( a ~ conclusion)*

**foreground** (fôr′ground′, fōr′ground′), ***n.*** (١) بەردەم (وێنه)؛ بەر. (٢) دیارترین شوێن.

**forehand** (fôr′hand′, fōr′hand′), ***adj.*** (١) بەردەم؛ پێشترین.
(٢) به پێشەوەی دەست کراو (لێدانی یاری تەنس).
***n.*** (١) جێی بەردەم؛ جێی سوودبەخش.
(٢) بەشی پێشەوەی ئەسپ (که له بەردەمی سواردایه).
(٣) لێدانی تۆپ به پێشەوەی دەست (یاری تەنس).

**forehead** (fôr′id, for′əd), ***n.*** (١) ناوچەوان؛ تەختی ناوچەوان؛ تەوێڵ. (٢) بەردەم یا پێشەوەی شتێك.

**foreign** (fôr′in, for′ən), ***adj.*** (١) بێگانه؛ هی بێگانه؛ دەرەکی.
(٢) ناسرووشتی؛ نائاسا؛ بەشێك نییه له:
*( Unkindness is ~ for his nature.)*
(٣) پەیوەندی پێوه نییه؛ دەرەکی.

**foreign affairs,** کاروباری دەرەوه.

**foreigner** (fôr′in-ēr, for′ən-ēr), ***n.*** (١) بێگانه؛ کەسێکی بێگانه.
(٢) ئاواره؛ دەرەکی؛ ئاوەکی. (٣) شتێکی بێگانه (بەتایبەتی کەشتی).

**foreign exchange,** (١) ئالوگۆڕی پاره لەگەڵ وولاتان یا کەسانی بێگانه. (٢) حەواڵەو بڕوانامەی دارایی بێگانه.

**foreignism** (fôr′in-iz'm, for′ən-iz'm), ***n.*** ووته، خوو، یا نەریتێکی بێگانه.

**foreign legion,** هێزێکی سوپایی له بێگانه پێکهاتوو.

**foreign mission,** (١) دەستگایەکی ئاینی که دەستەیەك خەڵك دایان نابێت له وولاتێکی بێگانەدا (بەتایبەتی لەلایەن خاچ پەرستەکانەوه).
(٢) باڵیۆزخانەی وولاتێك له وولاتێکی بێگانه

**foreign office,** وەزارەتی دەرەوه.

**forejudge** (fôr-juj′, fōr-juj′), ***v.t.*** پێشەکی حوکم دان بەسەردا.

**foreknow** (fôr-nō′, fōr-nō′), ***v.t.*** پێشەکی زانین.

**foreknowledge** (fôr′nol′ij, fōr-nol′ij), ***n.*** پێشەکی زانین.

**forelock** (fôr′lôk′, fōr′lôk′), ***n.*** (١) پەرچەم؛ قژی ناوچەوان.
(٢) پەرچەمی ئەسپ و ماین.

**foreman** (fôr′mən, fōr′mən), ***n.*** (١) سەرۆکی دەستەی سوێندخواران (دادگا). (٢) سەرکار؛ سەروەستا؛ چاوەش.
**-foremanship** ***(n.).***

**foremost** (fôr′mōst′, fōr′məst), ***adj. & adv.*** یەکەم؛ هەره؛ لەپێشترین؛ گرنگترین؛ لەسەروو هەمووشتێکەوه.

**forename** (fôr′nām′, fōr′nām′), ***n.*** ناوی یەکەمی کەسێك.

**forenamed** (fôr′nāmd′, fōr′nāmd′), ***adj.*** ناوبراو؛ لەپێشدا ناوبراو.
**forenoon** (fôr′no͞on′, fōr-no͞on′), ***n.*** پێش نیوەڕۆ؛ چێشتەنگاو؛ کاتی نێوان هەتاوکەوتن و نیوەڕۆ.
***adj.*** لە بەیانیدا؛ لە چێشتەنگاودا.
**forensic** (fə-ren′sik), ***adj.*** دادگایی؛ دادگەری.
**foreordain** (fôr′ôr-dān′, fōr′ôr-dān′), ***v.t.*** چارەنووس نووسین؛ وەها بۆ بڕینەوە.
**-foreordination** ***(n.).***
**forereach** (fôr-rēch′, fōr-rēch′), ***v.t. & v.i.*** (١) پێشکەوتن؛ پەلەکردن و پێشکەوتن (کەشتی، بەلەم). (٢) بردنەوە (مەلەملێ)؛ پێشکەوتن.
**forerun** (fôr-run′, fōr-run′), ***v.t.*** (١) لە پێشییەوە هاتن. (٢) نیشانەی ئەوە بوون.
**forerunner** (fôr-run′ēr, fōr′run′ēr), ***n.*** (١) پێشەنگ. (٢) نیشانەی دواڕۆژ. (٣) (ا) کەسی پێشووتر (ب) باوو باپیر
**foresaid** (fôr′sed′, fōr′sed′), ***adj.*** لەپێشدا ناوبراو؛ هی پێشووتر ناوبراو.
**foresee** (fôr-sē′, fōr-sē′), ***v.t.*** ڕابینین؛ ڕا چاوەڕوان کردن؛ پێشەکی بینین یا زانین؛ پێشبینین.
**-foreseer** ***(n.).***
**foreshadow** (fôr-shad′ō, fōr-shad′ō), ***v.t.*** نیشانەی ڕوودانێکی دواڕۆژ بوون؛ پێشەکی ڕا گەیاندن یا دەرخستن.
**foreshow** (fôr-shō′, fōr-shō′), ***v.t.*** پێشەکی ڕا دەرخستن، پیشاندان. یا گەیاندن؛ نیشانەی ئەوە بوون.
**foresight** (fôr′sīt′, fōr′sīt′), ***n.*** (١) پێشبینی (٢) دووربینی؛ لێکدانەوە.
**foreskin** (fôr′skin′, fōr′skin′), ***n.*** پێستی سەری کێر کە لەکاتی خەتەنەکردندا دەبڕرێت.
**forest** (fôr′ist, for′ist), ***n.*** دارستان
***v.t.*** دارو درەخت تێدا ناشتن؛ کردن بە دارستان.
**forestall** (fôr-stôl′, fōr-stôl′), ***v.t.*** (١) ڕێ لێگرتن (بە کەوتنە خۆ پێشەکی) وەستاندن. (٢) چاوەڕوان کردن و چارەسەرکردن پێشەکی. (٣) قۆرخ کردن (بازرگانی).
**forestation** (fôr′is-tā′shən, for′is-tā′shən), ***n.*** ناشتنی دارستان و چاودێری کردن و پاراستنی
**forester** (fôr′is-tēr, for′is-tēr), ***n.*** (١) دارستاناس (٢) کارمەندی دارستان. (٣) دارستان نشین (مرۆڤ، گیاندار). (٣) جۆرێکە لە مۆرانە.
**forest ranger,** دارستانەوان؛ کارمەندی دارستان. (پێشی دەروترێ " ranger ").
**forestry** (fôr′is-tri, for′is-tri), ***n.*** (١) [Rare]، دارستان. (٢) دارستاناسی؛ زانستی دارستان؛ ناشتن و پاراستنی دارستان. (٣) بەخێوکردنی دارستان بۆ دارو تەختە
**foretaste** (fôr′tāst′, fōr′tāst′), ***n.*** بەرکول.
***v.t.*** [Rare], بەرکول کردن.
**foretell** (fôr-tel′, fōr-tel′), ***v.t.*** پێشبینین؛ نیشانەی ڕوودانێکی دواڕۆژ بوون.
**forethought** (fôr′thôt′, fōr′thôt′), ***n.*** (١) دووربینی؛ پێشەکی بیرلێکردنەوە. (٢) پێشەکی کەوتنەخۆو نەخشەدانان.
**foretold** (fôr-tōld′), *past tense and p.p. of* **foretell.**
**foretooth** (fôr′to͞oth′, fōr′to͞oth′), ***n.*** ددانی پێشەوە
**forever** (fēr-ev′ēr, fôr-ev′ēr), ***adv.*** (١) هەتاهەتا؛ بە یەکجاری. (٢) هەمیشە؛ بەردەوام
**forevermore** (fēr-ev′ēr-môr′, fôr-ev′ēr-môr′), *adv.* = forever.
**foreverness** (fēr-ev′ēr-nis, fôr-ev′ēr-nis), ***n.*** هەتاهەتایی؛ هەمیشەیی.
**forewarn** (fôr-wôrn′, fōr-wôrn′), ***v.t.*** پێشەکی ئاگادارکردن؛ پێشەکی وریاکردنەوە.
**foreword** (fôr′wûrd′, fōr′wûrd′), ***n.*** پێشەکی (پەڕتووک)؛ سەرەتا.
**forfeit** (fôr′fit), ***n.*** (١) سزا (پارە، ماف)؛ لێ سەندنەوە (ماف). (٢) شتێکی لێ سەنراو لەباتی تاوانێك؛ شتی دەست لێ هەڵگیراو لەباتی تاوانێك. (٣) دەستهەڵگرتن (ماف)؛ وازهێنان.
***v.t.*** دەستهەڵگرتن یا لێ سەندنەوەی مافێك لەبەر تاوانبارییەك.
**forfeiture** (fôr′fi-chēr), ***n.*** (١) دەست لە ماف هەڵگرتن؛ دەست لێ بەردار بوون. (٢) شتێکی دەست لێ هەڵگیراو؛ سزا.
**forgave** (fēr-gāv′, fôr-gāv′), *past tense of* **forgive.**
**forge** (fôrj, fōrj), ***n.*** (١) کوورەی ئاسنگەر. (٢) دووکانی ئاسنگەر.
***v.t.*** (١) داڕشتن (کان)؛ کانزا تواندنەوەو شت لێ درووستکردنی. (٢) داڕشتن. (٣) ساختەکردن (بڕوانامە، چەکی بانق، پارە... هتد).
***v.i.*** (١) داڕشتن (کان). (٢) ساختەکردن.
**forge** (fôrj, fōrj), ***v.t. & v.i.*** بەردەوام بوون لەسەرو بەرەبەرە پێشکەوتن.
**forger** (fôr′jēr, fōr′jēr), ***n.*** (١) داڕێژەر؛ ئاسنگەر. (٢) چیرۆك هەڵبەست؛ درۆ هەڵبەست؛ درۆزن. (٣) ساختەکەر (پارە، بڕوانامە، چەك)؛ ساختەچی.
**forgery** (fôr′jēr-i, fōr′jēr-i), ***n.*** (١) ساختە؛ ساختەکاری (پارە، بڕوانامە، چەك). (٢) شتێکی ساختە.
**forget** (fēr-get′, fôr-get′), ***v.t.*** (١) لەبیرچوون؛ لەبیرچوونەوە؛ لەیادکردن. (٢) فەرامۆش کردن؛ خستنە پشت گوێ.
***v.i.*** لەبیرچوون؛ لەیادکردن.
forget oneself, (١) بیر هەر لە خەڵك کردنەوەو بیر لە خۆ نەکردنەوە؛ هەر بەتەنگ خەڵکەوە هاتن. (٢) ڕەوشتی ناشرین نواندن؛ ناشرینانە جووڵانەوە.
**forgetful** (fēr-get′fəl, fôr-get′fəl), ***adj.*** (١) فەرامۆشکەر. (٢) بێ هۆش.
-forgetfulness ***(n.).***
**forget-me-not** (fēr-get′mi-not′), ***n.*** جۆرە گوڵ و ڕووەکێکە.
**forgive** (fēr-giv′, fôr-giv′), ***v.t.*** (١) لێبووردن؛ لێخۆشبوون؛ بەخشین؛ گەردن ئازادکردن. (٢) لە قەرز خۆشبوون.
***v.i.*** لێبووردن؛ لێخۆشبوون.
-forgivable *(adj.)*; **forgiver** ***(n.).***
**forgiveness** (fēr-giv′nis, fôr-giv′nis), ***n.*** لێبووردن؛ بەخشین؛ لێخۆشبوون؛ گەردن ئازادکردن؛ بەخشندەیی.
**forgiving** (fēr-giv′iŋ, fôr-giv′iŋ), ***adj.*** بەخشندە؛ لێبوورد؛ لێبووردوو: ***(a ~ person)***.
**forgo** (fôr-gō′), ***v.t.*** (١) دەست لێ هەڵگرتن؛ وازلێهێنان؛ پارێزکردن. (٢) [Archaic]، (ا) تێپەڕبوون. (ب) گوێ پێ نەدان؛ چاو لێ پۆشین. (ج) بەجێهێشتن.
**forgone** (fôr-gôn′, fōr-gon′), *p.p. of* **forgo.**
**forgot** (fēr-got′, fôr-got′), *past tense of* **forget.**
**forgotten** (fēr-got′'n, fôr-got′'n), *p.p. of* **forget.**
**fork** (fôrk), ***n.*** (١) چنگاڵ؛ چەتاڵ. (٢) سێلك (کشتوکاڵ). (٣) دووڕیانە؛ شوێنی جیابوونەوەی ڕووبار یا بەیەکگەیشتنی زێکانی ڕووبارێك (٤) ڕێ؛ ڕێگەیەکی جیابووەوە؛ لق.
*v.i.* لق لێ جیابوونەوە؛ بوون بە دوو بەشەوە (ڕێ، ڕووبار): ***(The road ~s here.)***
*v.t.* (١) وەك چنگاڵ لێکردن. (٢) جیاکردنەوە؛ بەش بەش کردن.

(٣) هەڵگرتن بە سێلك.

**forked** (fôrkt), *adj.* دووفلیقانە؛ پەل پەل؛ دووفاق.

**forlorn** (fẽr-lôrn′, fôr-lôrn′), *adj.* (١) جێماو؛ بەجێهێڵراو.

(٢) غەمبار؛ بارکەوتوو؛ دڵتەنگ؛ کوڵۆل. (٣) بێ هیوا؛ هیوا بڕاو.

**form** (fôrm), *n.* (١) شێوە. (٢) لەش (مرۆڤ، گیاندار)؛ قەد.

(٣) داڕێژگە؛ دەق؛ قالب.

(٤) شێواز؛ چۆنێتی: ***(Democracy is a ~ of government.)*** .

(٥) دەستوور (کردنی کارێك).

(٦) ئیستیمارە؛ فۆرم.

(٧) جۆر؛ چەشن: ***(Man is a ~ of animal life.)*** .

(٨) بار؛ دۆخ (٩) کونە کەروێشك. (١٠) پۆل (قوتابخانە)؛ پلە.

(١١) [Archaic]، جوانی. (١٢) شێوەی ووشە (ڕێزمان).

*v.t.* (١) درووستکردن؛ کردن؛ دامەزراندن؛ پێکهێنان؛ پێکەوەنان.

(٢) فێرکردن؛ ڕاهێنان؛ داڕشتن (ڕەووشت). (٣) فێربوون (خوو)؛ ڕاهاتن.

(٤) هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بیرلێکردنەوە.

(٥) پێکهێنان: ***(The boys ~ed lines.)*** .

(٦) پێکهێنان:

***(Thirteen States ~ed the original United States.)***

(٧) درووستکردن؛ پێکەوەنان (ڕستە): ***(to ~ a sentence)*** .

*v.i.* (١) پێکهاتن؛ شێوە وەرگرتن؛ دەق بەستن؛ دەق گرتن.

(٢) هاتنەدی؛ پەیدابوون.

**bad form,** ڕەووشتی ناشرین.

**good form,** ڕەووشتی جوان

**-form** (fôrm), پاشکۆیەکە بەمانای: (١) وەك؛ لە شێوەی:

***(cuneiform)***

(٢) ئەوەندە شێوەی هەیە: ***(uniform)*** .

**formal** (fôr′m'l), *adj.* (١) ڕووکەش؛ هی دەرەوە؛ دیار. (٢) ناوەکی.

(٣) بە دەستوور؛ بەپێی دەستوور (٤) ڕووکەشی.

(٥) میری کار؛ میری.

(٦) (ا) لە بۆنەی تایبەتیدا لەبەردەکرێت: ***(a ~ dress)*** .

(ب) ڕەسمی؛ بە دەستوور: ***(a ~ dance)*** .

(٧) ڕێكوپێك؛ وورد.

(٨) ڕەسمی: ***(a ~ contract)*** .

(٩) بەپێی شێوازی ڕاست: ***(~ language)*** .

*n.* [Colloq.], (١) سەما بە جلی ڕەسمییەوە.

(٢) کراسی ڕەسمی ئافرەت.

**formality** (fôr-mal′ə-ti), *n.* شتێك کە هەر بۆ ناو بکرێت یا بووترێت؛

نەریتی هیچ‌ڕپووچ‌و ڕووکەشی؛ شتێکی ڕووکەشی.

**formalize** (fôr′m'l-īz′), *v.t.* شێوە پێدان؛ چەسپاندن؛

بەپێی دەستوور کردن.

**-formalization** *(n.).*

**formally** (fôr′m'l-i), *adv.* (١) بە ڕەسمی؛ بە دەستوور.

(٢) لەڕووی شێوازو ڕووکەشەوە.

**format** (fôr′mat), *n.* (١) شێوەو قەوارەو جۆری ڕێکخستنی پەرتووك

یا گۆڤارێك. (٢) شێوازی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی؛ شێواز.

**formation** (fôr-mā′shən), *n.* (١) پێکهێنان؛ دامەزراندن؛ پێکهاتن؛

درووستکردن. (٢) شتێکی دامەزراو یا پێکهاتوو.

(٣) ڕێكوپێکی؛ جۆری ڕێکخستن.

(٤) چەند چینێکی هەمان کان یا بەرد (زەمینناسی).

(٥) پۆل (باڵندە، فڕۆکە)؛ دەستە (سەرباز).

**formative** (fôr′mə-tiv), *adj.* (١) پێکهێنەر؛ پەروەردەکەر:

***(A teacher is a ~ influence on a child.)***

(٢) هی پەروەردەبوون؛ هی گەورەبوون؛ ساوا. ***(a child's ~ years)*** .

(٣) ووشە پێکهێنەر (پاشکۆ، پێشکۆ)

*n.* (١) پاشکۆ یا پێشکۆیەك کە ووشەی لێ پێك دەهێنرێت.

(٢) ووشەیەکی وەها پێکهاتوو.

**former** (fôr′mẽr), *adj.* (١) پێشوو؛ ڕابوردوو؛ جاران؛ پێشووتر:

***(in ~ times)***

(٢) یەکەم؛ هی یەکەم؛ هی پێشتر ناوبراو.

**former** (fôr′mẽr), *n.* پێکهێنەر؛ درووستکەر؛ دامەزرێنەر.

**formerly** (fôr′mẽr-li), *adv.* لەوەوپێش؛ جاران؛ جاری جاران.

**formidable** (fôr′mi-də-b'l), *adj.* (١) سامناك؛ بە سام؛ سامدار؛

بەشکۆ؛ شکۆدار. (٢) سەخت؛ گران؛ زەحمەت.

-formidably *(adv.)*; **formidability** *(n.).*

**formless** (fôrm′lis), *adj.* بێ شێوە؛ بێ سەروقنگ

**form letter,** نامەیەك کە دەقاودەقی گەلێك نامەی ترە (کۆمپانیاو

دەستگای تر دەینێرن بۆ خەڵك).

**formula** (fôr′myoo-lə), *n.* (١) ڕێژە (زمانەوانی)؛ قالبی داڕشتن.

(٢) دەستوور؛ شێواز. (٣) (ا) ڕەچەتە؛ شێوەی دەرمان گرتنەوە

(ب) شێوەی ئامادەکردنی خواردەمەنی بۆ منداڵی ساوا؛ ئەم جۆرە خواردنە.

(٤) هاوکێشە (بیرکاری، کیمیا ... هتد).

**formulate** (fôr′myoo-lāt′), *v.t.* پێکهێنان؛ دانان؛ داڕشتن؛

گەڵاڵەکردن؛ ڕێكوپێك کردن: ***(to ~ a theory)*** .

-formulator *(n.).*

**formulation** (fôr′myoo-lā′shən), *n.* دانان؛ پێکهێنان؛ داڕشتن؛

گەڵاڵەکردن.

**formulism** (fôr′myoo-liz'm), *n.* پشت پێ بەستن‌و پەیڕەوی

کردنی ڕێژەو دەستوور.

**formulize** (fôr′myoo-līz′), *v.t.* = **formulate.**

**fornicate** (fôr′ni-kāt′), *v.i.* داوێن پیسی کردن؛ جووت بوون؛

گان کردن؛ زیناکردن.

-fornicator *(n.).*

**fornication** (fôr′ni-kā′shən), *n.* داوێن پیسی؛ جووت بوون؛

گان کردن؛ زینا؛ زیناکردن.

**forsake** (fẽr-sāk′, fôr-sāk′), *v.t.* (١) وازلێهێنان (خوو، بیروڕا)؛

دەست لێ هەڵگرتن. (٢) بەجێهێشتن؛ پشت لێ هەڵکردن؛ پشت تێکردن؛

دەست لێ بەردان.

**forsaken** (fẽr-sāk′ən, fôr-sāk′ən), *adj.* جێهێڵراو (جێگە،

مرۆڤ)؛ دەست لێ هەڵگیراو؛ پشت لێ هەڵکراو؛ چۆڵ کراو؛ چۆڵ؛ چۆڵ‌ڕەهۆڵ؛

دڵتەنگ.

**forsook** (fẽr-sook′, fôr-sook′), *past tense of* **forsake.**

**forsooth** (fẽr-sōōth′, fôr-sōōth′), *adv.* [Archaic], بێ گومان؛

بەڕاستی؛ لە ڕاستیدا.

**forswear** (fôr-swâr′), *v.t.* (١) پاکانەکردن؛ سوێندخواردن بە

دەست هەڵگرتن لە شتێك (٢) حاشالێکردن.

*v.i.* بە درۆ سوێندخواردن؛ بەڵێن شکاندن.

forswear oneself, سوێند بە درۆ خواردن.

**forsworn** (fôr-swôrn′, fôr-swōrn′), *p.p. of* **forswear.**

*adj.* سوێند بە درۆ خواردوو.

**fort** (fôrt, fōrt), *n.* (١) قەڵا؛ سەنگەر. (٢) ئۆردوگا؛ لەشکرگا؛ قشڵە.

hold the fort, شەڕ لەسەر کردن؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەرگری کردن.

**forte** (fôrt), *n.* (١) ئەو کارە یا ڕشتەیەی کەسێك زۆر شارەزایی‌و

کارامەیی تێدا هەبێت: ***(Writing is his ~.)*** .

(٢) بەهێزترین بەشی دەمە شیر.

**forte** (fôr′ti, fôr′tā), *adj. & adv.* بەرز (دەنگی مۆسیقا).

**forth** (fôrth, fōrth), *adv.* (١) پێشەوە (کات، جێ، پلە).

(٢) دەرەوە؛ دەرێ؛ ڕوو؛ دیار.

(٣) [Archaic]، دەرەوەی وڵات.

and so forth, وە هەروەها؛ وە شتی تری وەها؛ هتد.

**forthcoming** (fôrth′kum′iŋ), *adj.* (١) داهاتوو؛ بەڕێوەیە؛

نزیکی ڕوودانە: *( the ~ election)* .
(٢) ئامادە؛ دەستگیر دەبێ؛ هاتوو:
*( The promised money was not ~ .)*
(٣) هیچ نەشارەوە؛ هاوکاریکەر: *( a ~ witness)* .
*n.* هاتنە پێشەوە؛ هاتنەڕوو.
**forthright** (fôrth′rīt′, fōrth′rīt′), *adj.* (١) بۆ پێشەوە؛ یەکسەر.
(٢) ڕاستەوڕاست؛ قسەلەڕوو؛ ڕاست؛ ڕاستگۆ؛ لەڕوو.
*adv.* (١) بۆ پێشەوە؛ بە ئاشکرا؛ بەبێ شاردنەوە؛ بە ڕاستەوڕاستی.
(٢) دەستبەجێ؛ یەکسەر؛ دەمودەست؛ ڕاستەوخۆ.
**forthwith** (fôrth′with′, fōrth′with′), *adv.* دەستبەجێ؛
یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ؛ دەمودەست.
**fortieth** (fôr′ti-ith), *adj.* (١) چلەمین؛ چلەم. (٢) چل یەك.
**fortification** (fôr′tə-fi-kā′shən), *n.* (١) بەهێزکردن
(بە دروستکردنی سەنگەرو دیوارو خەنەق بە دەوردا)؛ قایم کردن.
(٢) شتی بەهێزکەر (سەنگەر، دیوار، خەنەق).
(٣) قەڵا؛ سەنگەر؛ شوێنێکی بەهێزکراوو پارێزراو.
**fortify** (fôr′tə-fī′), *v.t.* (١) بەهێزکردن (بە دروستکردنی سەنگەرو
دیوارو خەنەق). (٢) بەهێزکردن
(٣) پاڵپشتی کردن: *( He ~ied his argument with statistics.)* .
(٤) بەهێزکردنی خواردنەوەی سەرخۆشکەر (بە زیادکردنی کحول).
(٥) بەهێزکردنی خواردەمەنی (بە تێکردنی ڤیتامینات و شتی تر).
*v.i.* سەنگەر دروستکردن.
-fortifiable *(adj.)*; fortified *(adj.)*; fortifier *(n.)*.
**fortitude** (fôr′tə-tōōd′, fôr′tə-tūd′), *n.* بەجەرگی؛ دەربڕدن یا
خۆڕاگرتن لە کاتی ناخۆشی و کارەساتدا.
**fortitudinous** (fôr′tə-tōō′də-nəs, fôr′tə-tū′də-nəs), *adj.*
ئازا؛ بەجەرگ؛ خۆڕاگر بەرامبەر ناخۆشی و کارەسات.
**fortnight** (fôrt′nīt, fôrt′nit), *n.* [Chiefly British], دوو هەفتە.
**fortnightly** (fôrt′nīt-li), *adv. & adj.* دوو هەفتەیی؛
هەر دوو هەفتە جارێك.
*n.* گۆڤارێك کە هەر دوو هەفتە جارێك دەردەچێت.
**fortress** (fôr′tris), *n.* قەڵا؛ سەنگەر؛ شوێنێکی پارێزراو.
*v.t.* پاراستن بە سەنگەر یا قەڵا.
**fortuitous** (fôr-tōō′ə-təs, fôr-tū′ə-təs), *adj.* ڕێکەوت؛
بە ڕێکەوت ڕوودراو.
-fortuitously *(adv.)*; fortuitousness *(n.)*.
**fortuity** (fôr-tōō′ə-ti, fôr-tū′ə-ti), *n.* ڕێکەوت؛ ڕیکەوتن.
**fortunate** (fôr′chə-nit), *adj.* (١) بەختەوەر؛ بە بەخت؛ بەختدار؛
بە شانس؛ خواپێداو. (٢) بهات؛ هات؛ باش؛ پەسەند.
**fortunately** (fôr′chə-nit′li), *adv.* خۆشبەختانە؛ ئەوەی باش بوو؛
بۆ بە شانسی.
**fortune** (fôr′chən), *n.* (١) بەخت؛ چارەنووس؛ شانس؛ ئامەد؛ بەش؛
ناوچەوان. (٢) بەختەوەری؛ بە بەختی؛ بهات. (٣) سامان؛ سامانێکی زۆر.
**tell one's fortune,** دەستگرتنەوە؛ چارەنووس خوێندنەوە؛ فاڵگرتنەوە.
**fortune hunter,** کەسێك کە دەیەوێت دەوڵەمەند بێت لە ڕێگەی
ژنهێنان یا شووکردنەوە.
**fortune-teller** (fôr′chən-tel′ēr), *n.* فاڵچی؛ فاڵگر؛ فەتاح فاڵ؛
دەستگرەوە
**forty** (fôr′ti), *adj. & n.* چل
**the forties,** چلەکان (هی سەدەیەك یا تەمەنی مرۆڤێك).
**forum** (fôr′əm, fō′rəm), *n.* (١) دیوانگە. (٢) دادگا.
(٣) کۆڕ (بەتایبەتی بۆ لێدوانی کاروباری گشتی).
**forward** (fôr′wērd), *adj.* (١) لەپێشەوە؛ پێشەوە؛ بۆ پێشەوە.
(٢) پێشکەوتوو. (٣) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتوو.
(٤) ئامادە بۆ یارمەتیدان؛ بە پەرۆش (بۆ یارمەتی):
*( He was ~ in helping.)*
(٥) ڕوو قایم؛ ڕوو هەڵماڵراو؛ بێ شەرم.
(٦) بۆ پاشەڕۆژ.
*adv.* (١) بۆ پێشەوە؛ بەرەو پێشەوە.
(٢) بەرەو دواڕۆژ: *( Look ~ . )* .
(٣) بەرچاو؛ دیار: *( He brought ~ an opinion.)* .
*n.* یاریکەری ڕیزی پێشەوە؛ یاریکەری هێرشبەر.
*v.t.* (١) پێشخستن؛ برەوپێدان. (٢) ناردن.
(٣) حەواڵەکردن یا ناردنی پۆستە بۆ ناونیشانی تازەی کەسێك:
*( F~ her mail to New York.)*
**backwards and forwards,** بۆ دواوەو بۆ پێشەوە.
**come forward,** هاتنە پێشەوە؛ وەرە پێشەوە.
**Forward!** بۆ پێشەوە؛ بۆ پێشەوە بڕۆ!
**look forward,** بەرەو دواڕۆژ ڕوانین؛ بیر لە دواڕۆژ کردنەوە.
**look forward to,** بە شەوقەوە چاوەڕێ کردن؛ بۆ بەپەرۆشەوە بوون.
**forwarder** (fôr′wēr-dēr), *n.* حەواڵەکەر؛ نێرەر؛ بار حەواڵەکەر.
**forwards** (fôr′wērdz), *adv.* = forward.
**fossa** (fos′ə), *n.* چاڵ؛ بۆشاییەکی بچووك.
**fosse** (fôs, fos), *n.* خەنەق (بۆ پارێزگاری).
**fossil** (fos′'l), *n.* (١) بەردو کانی ژێر زەمین.
(٢) پاشماوەی بەردینی گیاندارو ڕووەکی لە کۆنەوە مردووی ژێرخاك.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی کۆنباو یا کۆنەپەرست.
*adj.* (١) تایبەتی بە پاشماوەی بەردینی گیاندارو ڕووەکی لە کۆنەوە مردوو.
(٢) کۆن؛ کۆنباو؛ ڕزیو.
**fossilize** (fos′'l-īz′), *v.t.* (١) وەك بەرد لێکردن؛ کردن بە بەرد
(پاشماوەی ڕووەك و گیانداری لە کۆنەوە مردوو). (٢) کۆنباو کردن
*v.i.* بوون بە بەرد؛ کۆنباو بوون؛ ڕزین.
-fossilization *(n.)*.
**foster** (fôs′tēr, fos′tēr), *v.t.* (١) بەخێوکردن؛ گەورەکردن؛
پەروەردەکردن (منداڵ)؛ هەڵگرتنەوە (منداڵ).
(٢) پەرە پێ سەندن؛ هاندان؛ برەو پێدان؛ بوون بە هۆی:
*( Hunger ~s disease.)*
(٣) لە دڵدا بوون (هیوا)؛ بەتەما بوون:
*( She ~ed hopes of becoming an actress.)*
**fosterage** (fôs′tēr-ij, fos′tēr-ij), *n.* (١) پەروەردەکردن یا
بەخێوکردنی منداڵێکی هەڵگیراوە. (٢) پێ سپاردنی منداڵێکی هەڵگیراوە بە
بەخێوکەرەکانی. (٣) پەرە پێ سەندن؛ برەوپێدان؛ هاندان.
**foster brother,** شیر برا؛ برای هەڵگیراوە.
**foster child,** منداڵێکی هەڵگیراوە.
**foster father,** باوکێك کە منداڵێکی هەڵگیراوە بەخێودەکات.
**fosterling** (fôs′tēr-liŋ, fos′tēr-liŋ), *n.* منداڵێکی هەڵگیراوە.
**foster mother,** دایکێك کە منداڵێکی هەڵگیراوە بەخێودەکات.
**foster parent,** دایکێك یا باوکێك کە منداڵێکی هەڵگیراوە بەخێودەکات.
**foster sister,** شیر خوشك؛ خوشکی هەڵگیراوە.
**fought** (fôt), *past tense and past participle of* **fight.**
**foul** (foul), *adj.* (١) بۆگەن (بۆن): *( a ~ odor)* .
(٢) پیس؛ پیس و پۆخڵ.
(٣) بۆگەن کردوو (خواردەمەنی)؛ بۆگەن.
(٤) ناشرین (زمان، ڕەوشت)؛ پیس: *( ~ language)* .
(٥) ناپەسەند؛ زۆر خراپ؛ بەد: *( a ~ murder)* .
(٦) ناخۆش (ئاووهەوا)؛ زریاناوی؛ باوبۆراناوی: *( ~ weather)* .
(٧) ئاڵۆسکاو (پەت). (٨) ناڕەوا.
(٩) ناپاك (مرۆڤ، کردەوە). (١٠) [Colloq.]، ناخۆش.
(١١) فاوڵ (یاری، وەرزش)؛ هەڵە (وەرزش). (١٢) پڕ لە هەڵە (چاپەمەنی).
*n.* فاوڵ (یاری).

*v.t.* (١) پیس کردن. (٢) ئابڕووبردن؛ سەرشۆڕکردن؛ شەرەف شکاندن.
(٣) بەردەم گرتن؛ گرتن (بۆری، کون)؛ بەستن؛ بەر بەستن:
*( Grease often ~s sink drains.)*
(٤) ئالۆسکاندن. (٥) فاوڵ کردن (یاری، وەرزش)؛ هەڵەکردن (وەرزش).
(٦) خۆ پیادان.
*v.i.* (١) پیس بوون. (٢) گیران (کون، بۆری). (٣) ئالۆسکان.
(٤) خۆ پیادان؛ بەرکەوتن. (٥) فاوڵ کردن (یاری).
**foul up,** [Colloq.], شێواندن؛ تێکدان؛ تێکوپێکدان؛ ئالۆسکاندن.
**foul-mouthed** (foul′mouthd′, foul′moutht′), ***adj.*** بەدگۆ؛
دەم پیس؛ جوێن فرۆش؛ زمان پیس؛ بەدزمان.
**foulness** (foul′nis), ***n.*** (١) پیسی؛ بۆگەنی؛ پیسێتی؛ ناپەسەندی.
(٢) شتێکی پیس و بۆگەن.
**foul play,** (١) گزی؛ ساختە.
(٢) ناپاکی (کردەوە)؛ کارێکی ناپاکانەو خراپ (وەك کوشتن).
**found** (found), *past tense and past participle of* **find.**
**found** (found), ***v.t.*** (١) بناغەدانان؛ دروستکردن؛ بنچینەدانان:
*( The city was ~ed in 1700 .)*
(٢) دانان؛ دامەزراندن؛ پێکهێنان:
*( The college was ~ed in 1970 .)*
**found** (found), ***v.t.*** داڕشتن (کانزا).
**foundation** (foun-dā′shən), ***n.*** (١) دامەزراندن؛ بنچینە دانان؛
دانان. (٢) (ا) دەستگایەکی خێرخوازی دارایی بۆ پارەپێدانی نەخۆشخانە،
قوتابخانە. یا ڕێکخراوێکی خێرخواز.
(ب) پارەو سەرمایەی ئەم جۆرە دەستگایە.
(٣) بناغە؛ بنچینە؛ بن و بنچینە.
**foundation stone,** بەردی بناغە
**founder** (foun′dẽr), ***v.i.*** (١) پێ داچوون؛ پێ هەڵکەوتن؛
ساتمەکردن. (٢) پڕبوون لە ئاو و نوقم بوون (کەشتی، بەلەم)؛ نوقوم بوون.
(٣) تێکشکان؛ ڕووخان؛ ژێرکەوتن.
***v.t.*** نوقوم کردن؛ تێکشکاندن.
***n.*** ئاوسانی سمی ئەسپ.
**founder** (foun′dẽr), ***n.*** دامەزرێنەر؛ دانەر
**founder** (foun′dẽr), ***n.*** داڕێژەر
**foundling** (found′liŋ), ***n.*** منداڵێکی بەجێهێڵراو لەلایەن باوك و
دایکییەوە کە نەزانرێ کێن.
**foundry** (foun′dri), ***n.*** (١) داڕشتن (کانزا).
(٢) داڕشتنگا؛ داڕشتگە.
**fount** (fount), ***n.*** (١) کانی؛ کارێز.
(٢) سەرچاوە: *( a ~ of wisdom)* .
**fountain** (foun′t'n), ***n.*** (١) کانی؛ کارێز.
(٢) سەرچاوەی ئاو، ڕووبار، یا جۆگە.
(٣) سەرچاوە. (٤) فوارە.
(٥) عەماراو؛ عەماری شلە (وەك هی مەرەکەب، نەوت... هتد).
**fountainhead** (foun′t'n-hed′), ***n.*** (١) سەرچاوەی ئاو؛
سەرچاوەی کانی. (٢) سەرچاوە.
**fountain pen,** پاندان؛ پێنووسی مەرەکەب.
**four** (fôr, fōr), ***adj. & n.*** چوار
**on all fours,** بە گاگۆڵکێ؛ گاگۆڵکێ.
**four-dimensional,** چوارلایی
**fourfold** (fôr′fōld′, fōr′fōld′), ***adj. & adv.*** چوار ئەوەندە؛
چوارقات
**four-footed** (fôr′foot′id, fōr′foot′id), ***adj.*** چوارپێ
**four-letter word,** وشەیەکی چوار تیپی ناشرین یا پیس
(وەك **fuck, shit, etc.**).
**fourscore** (fôr′skôr′, fōr′skōr′), ***adj. & n.*** هەشتا

**foursome** (fôr′səm, fōr′səm), ***adj.*** چوارکەسی؛ چواری.
***n.*** چوارکەسی؛ تاقمێکی چوارکەسی
**fourteen** (fôr′tēn′, fōr′tēn′), ***adj. & n.*** چواردە.
**fourteenth** (fôr′tēnth′, fōr′tēnth′), ***adj. & n.*** (١) چواردەهەم؛
چواردەهەمین. (٢) چواردەیەك.
**fourth** (fôrth, fōrth), ***adj. & n.*** (١) چوارەم؛ چوارەمین.
(٢) چواریەك.
**fourthly** (fôrth′li, fōrth′li), ***adv.*** چوارەم؛ چوارەمین.
**four-wheel** (fôr′hwēl′, fōr′hwēl′), ***adj.*** چوارپێچکەیی؛
چوارپێچکە: *( a ~ drive)* .
**four-wheeled** (fôr′hwēld′, fōr′hwēld′), ***adj.*** چوارپێچکەیی؛
چوارپێچکە؛ چوارپێچکەدار.
**fowl** (foul), ***n.*** (١) مەل؛ باڵندە؛ باڵدار.
(٢) باڵندەی ماڵی (مریشك، مراوی، قاز).
(٣) گۆشتی باڵندە بەتایبەتی هی ماڵی.
*v.i.* ڕاوکردنی باڵندەی کێوی.
**fowler** (foul′ẽr), ***n.*** ڕاوکەری باڵندەی کێوی.
**fox** (foks), ***n.*** (١) ڕێوی. (٢) فەرو یا پێستی ڕێوی.
(٣) کەسێکی فێڵبازو زۆڵ. (٤) گوش.
(٥) [Obs.]، جۆرە شیرێکە. (٦) [Slang]، ئافرەتێکی جوان.
*v.t.* (١) ڕەنگ کردن (بە ڕەنگی قاوەیییەکی سوورباو)
(٢) فێڵ لێکردن؛ هەڵخەڵەتاندن.
(٣) پێڵاو پینەکردن یا چاککردنەوە.
**foxed** (fokst), ***adj.*** (١) ڕەنگ کراو (بە ڕەنگێکی قاوەیی سووربباو).
(٢) هەڵخەڵەتاو. (٣) پینەکراو (پێڵاو).
**foxglove** (foks′gluv′), ***n.*** جۆرە ڕووەکێکە.
**foxhole** (foks′hōl′), ***n.*** چاڵێکە وەك سەنگەر سەرباز خۆی تێدا
لە دوژمن دەپارێزێ.
**foxhound** (foks′hound′), ***n.*** تانجی؛ جۆرە سەگێکی ڕاوە.
**fox hunt,** ڕاوە ڕێوی.
**foxily** (fok′s'l-i), ***adv.*** زۆڵانە؛ بە زۆڵانە.
**foxiness** (fok′si-nis), ***n.*** زۆڵی؛ زۆڵێتی؛ فێڵبازی.
**fox-tail** (foks′tāl′), ***n.*** قەڵاس.
**fox terrier,** سەگێکی بچکۆلەی ڕاوە.
**fox trot,** (١) ڕەوتێکی تایبەتی ئەسپە. (٢) جۆرە سەمایەکە.
(٣) مۆسیقای ئەم سەمایە
**foxy** (fok′si), ***adj.*** (١) فێڵباز؛ زۆڵ. (٢) قاوەیی سووربباو.
(٣) ترشاو (بیرە، مەی).
(٤) پەڵەپەڵەدارو کەڕوو هەڵهێناو (پەڕتووکی کۆن).
**foyer** (foi′ẽr, foi′ä), ***n.*** داڵان.
**fracas** (frā′kəs), ***n.*** دەمەقاڵێ؛ شەڕەدەم؛ شەڕ.
**fraction** (frak′shən), ***n.*** (١) لەتکردن؛ بەشکردن؛ کەرتکردن.
(٢) پارچە؛ لەت؛ بەش؛ کەرت؛ نەخت. (٣) کەرت (بیرکاری).
**fractional** (frak′shən-'l), ***adj.*** (١) کەرتی (بیرکاری).
(٢) زۆر بچووك؛ زۆر کەم و بێ بایەخ.
**fractious** (frak′shəs), ***adj.*** (١) لاسار؛ سەرکێش. (٢) تەنگەجیکڵانە.
**fracture** (frak′chẽr), ***n.*** (١) شکان (ئێسقان)؛ قرنجان؛ قرنجاوی؛
شکاوی. (٢) درز.
*v.t. & v.i.* شکاندن (ئێسقان)؛ شکان؛ قرنجاندن؛ قرنجان (ئێسقان).
**fragile** (fraj′əl), ***adj.*** ناسك؛ بە ئاسانی دەشکێ؛ بەرگەنەگر.
-fragility *(n.).*
**fragment** (frag′mənt), ***n.*** (١) پارچە؛ لەت؛ کەرت؛ کوت.
(٢) بەشێکی ناتەواو.
**fragmentary** (frag′mən-ter′i), ***adj.*** پچڕپچڕ؛ پارچە پارچە؛
لەت لەت؛ کەرت کەرت؛ بەش بەش.

-fragmentariness *(n.)*.

**fragmentation** (frag´mən-tā´shən), ***n.*** پچڕپچڕ کردن؛ پارچە پارچە بوون؛ بەش بەش بوون؛ کەرت کەرت بوون؛ لەت لەت بوون.

**fragmentation bomb,** بۆمبایەکە کە تەقییەوە پارچە پارچە دەبێت و بلاودەبێتەوە و خەڵک دەکوژێت.

**fragmented** (frag′mən-tid), ***adj.*** پچڕپچڕ؛ لەت لەت؛ کەرت کەرت؛ بەش بەش.

**fragmentize** (frag′mən-tīz´), ***v.t.*** پچڕپچڕ کردن؛ لەت لەت کردن؛ پارچە پارچە کردن.

**fragrance** (frā′grəns), ***n.*** (١) بۆن خۆشی. (٢) بۆنێکی خۆش.

**fragrant** (frā′grənt), ***adj.*** بۆن خۆش.

**frail** (frāl), ***adj.*** (١) ناسك؛ بە ئاسانی دەشکێ.
(٢) لاواز؛ مرۆڤ؛ بێ هێز.
(٣) بە ئاسانی هەڵدەفریوێنرێ؛ بە ئاسانی دەخرێتە سەر ڕێی خراپە.
(٤) [Slang]، ژن؛ کچ؛ ئافرەت.

**frailty** (frāl′ti), ***n.*** (١) بێ هێمەتی؛ بە ئاسانی هەڵفریواندن.
(٢) کەموکورتی ڕەووشت.

**frame** (frām), ***v.t.*** (١) نەخشەدانان؛ نەخشەکێشان؛ دانان:
***( They ~d a constitution.)***
(٢) دروستکردن؛ پێکەوەنان.
(٣) ووتن؛ پرتاندن؛ دەربڕین: ***( His lips ~d the words.)***.
(٤) گونجاندن؛ شیان.
(٥) لە چوارچێوە گرتن؛ دەورەگرتن.
(٦) تاوان بۆ هەڵبەستن؛ بە درۆ تاوانبارکردن؛ سەپاندن بەسەردا (تاوان):
***( The police ~d him.)***

***n.*** (١) نەخشە؛ شێرازە. (٢) پەیکەری ئێسك؛ لەشی مرۆڤ؛ قاوغی لەش.
(٣) چوارچێوە. (٤) کلێشە. (٥) شێوە؛ شێواز.
(٦) سرووشت؛ باری هەست و هۆش و مێشك: ***( a happy ~ of mind)***.
(٧) [Slang]، بە درۆ تاوانبارکردن؛ تاوان بۆ دروستکردن.
(٨) خانەیەکی فیلمی سینەما.

**frame of mind,** باری هەست و هۆش و مێشك؛ هەڵوێست.

**frame-up** (frām′up´), ***n.*** [Colloq.]، تووش کردن بە تاوانی درۆ؛ تاوان بۆ هەڵبەستن.

**frame-work** (frām′wŭrk´), ***n.*** چوارچێوە؛ شێرازە.

**franc** (fraŋk), ***n.*** فرانك. پارەی فەرەنسا و سویسرایە.

**franchise** (fran′chīz), ***n.*** (١) ئازادی (لە ئەرکێك).
(٢) مافێکی تایبەتی (کە میری بەخشیبێتی بە کەسێك یا کۆمپانیایەك).
(٣) مافی دەنگدان. (٤) مافی تایبەتی فرۆشتنی شتێك.

**francolin** (fraŋ′kə-lin), ***n.*** پۆر.

**frank** (fraŋk), ***adj.*** (١) قسەلەڕوو؛ لەڕوو؛ ڕاستەڕوو؛ لەڕوودا دانەماو.
(٢) ئاشکرا؛ دیار.

***v.t.*** (١) پۆستە ناردن بەخۆڕایی، واتە بەبێ پوول.
(٢) مۆرکردنی پۆستە بۆ ناردنی بەخۆڕایی. (٣) ڕێی هاتوچۆ دان بەخۆڕایی.
(٤) ئازادکردن لە ئەرکێك.

***n.*** (١) مافی پۆستە ناردن بەخۆڕایی.
(٢) مۆری نیشانەی پۆستە ناردن بەخۆڕایی.
(٣) نامەیەك یا پۆستەیەکی بەخۆڕایی نێردراو.

**frankfurter, frankforter** (fraŋk′fēr-tēr), ***n.*** خواردنێکە لە گۆشتی گا یا بەراز دەکرێت شێوەی لوولەکییە چەند گرێیەك درێژە. (هەروەها پێشی دەڵێن: " weiner ").

**franklin** (fraŋk′lin), ***n.*** خاوەن زەوی‌وزارێکی سەدەی ناوەڕاست.

**frankly** (fraŋk′li), ***adv.*** (١) بە ئاشکرا؛ لەڕوو.
(٢) ئەوی ڕاست بێت؛ بەڕاستی.

**frankness** (fraŋk′nis), ***n.*** قسەلەڕوویی؛ قسە نەشاردنەوە؛ لەڕوودا دانەمان

**frantic** (fran′tik), ***adj.*** شێرزە؛ شلەژاو.

**frantically** (fran′ti-k'l-i, fran′tik-li), ***adv.*** شێرزە؛ بەشێرزەیی؛ بە هەڵەداوان؛ بە پەلەپرووزکێ.

**frater** (frā′tēr), ***n.*** [Obs.]، هاوڕێ؛ برادەر.

**fraternal** (frə-tŭr′n'l), ***adj.*** (١) برایی؛ برایانە؛ دۆستی.
(٢) تایبەتی بە دوانە (منداڵ).

-fraternalism *(n.)*.

**fraternity** (frə-tŭr′nə-ti), ***n.*** (١) (ا) برایەتی؛ برادەرێتی.
(ب) کۆڕی برایەتی. (٢) ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی قوتابیانی کۆڕی زانکۆیە ئەندامەکانی پێکەوە دەژین.

**fraternize** (frat′ēr-nīz´), ***v.i.*** (١) برادەرێتی لەگەڵ کردن؛ بوون بە برادەر. (٢) [Colloq.]، جووت بوون لەگەڵ دوژمن؛ دۆستایەتی لەگەڵ دوژمن گرتن (بەتایبەتی جووت بوون لەگەڵدا).

**fratricide** (frat′rə-sīd´, frā′trə-sīd´), ***n.*** (١) برا یا خوشکی خۆ کوشتن. (٢) برا یا خوشکی خۆ کوژ.

-fratricidal *(adj.)*.

**fraud** (frôd), ***n.*** (١) ساختە؛ فریو؛ فێڵ‌وتەڵەکە؛ درۆ؛ ساختەبازی.
(٢) [Colloq.]، ساختەباز؛ ساختەچی؛ کەسێکی ساختەباز.

**fraudulent** (frô′jə-lənt), ***adj.*** (١) ساختەچی؛ ساختەباز؛ ساختە.
(٢) لەسەر ساختە بەندە. (٣) بە ساختە کراوە یا دەسکەوتووە.

-fraudulence *(n.)*; fraudulency *(n.)*.

**fraught** (frôt), ***adj.*** پڕ؛ پڕ لە:
***( The situation is ~ with danger.)***

**fray** (frā), ***n.*** (١) دەمەقاڵێ؛ شەڕەقسە. (٢) شەڕ؛ ناکۆکی.
***v.t.*** [Archaic]، ترساندن.
***v.i.*** [Archaic]، شەڕکردن.

**fray** (frā), ***v.t.*** (١) شیکردنەوە؛ هەڵوەشاندن؛ دڕاندن (جل)؛ سوواندن:
***( to ~ the edges of a coat-sleeve)***
(٢) ماندووکردن (هەست، مێشك): ***( nerves ~ed by noise)***.
***v.i.*** شیبوونەوە؛ هەڵوەشان؛ سووان؛ ڕەوینەوە.
***n.*** ڕیشاڵ؛ تاڵی شیبووەوە یا هەڵوەشاو؛ جلی هەڵوەشاو.

**frazzle** (fraz′'l), ***v.t.*** (١) هەڵوەشاندن؛ شیکردنەوە؛ سوواندن.
(٢) ماندووکردن (هەست)
***v.i.*** (١) شیبوونەوە؛ هەڵوەشان. (٢) ماندووبوون
***n.*** [Colloq.]، (١) سووواوی؛ دڕاوی؛ شیبوونەوە
(٢) پرزۆڵە؛ ڕیشاڵە؛ تاڵی شیبووەوە.

**freak** (frēk), ***n.*** (١) هەوەس. (٢) هەوەسبازێتی؛ حولحولێتی.
(٣) مرۆڤ، گیاندار، یا ڕووەکێکی نائاسای دەعبایی سەیر.

***v.t. & v.i.*** ( ~ **out** ), زراوچوون؛ زۆر ترسان و کردەوەی سەیر کردن.
***adj.*** سەیر؛ نائاسا؛ دەعبایی.

**freakish** (frēk′ish), ***adj.*** (١) هەوەسباز؛ حولحولی
(٢) سەیر؛ نائاسا؛ دەعبایی.

**freaky** (frēk′i), ***adj.*** (١) هەوەسباز؛ حولحولی
(٢) سەیر؛ نائاسا؛ دەعبایی. (٣) [Colloq.]، ترسناك؛ سامناك.

**freckle** (frek′'l), ***n.*** شڵ؛ شلە؛ کونج
***v.t.*** شڵ کردن.
***v.i.*** شڵ بوون؛ کونج بوون.

-freckly *(adj.)*.

**free** (frē), ***adj.*** (١) سەربەخۆ؛ سەربەست. (٢) ئازاد: ***( a ~ people)***.
(٣) بەرەڵا. (٤) ئازادکراو (دادگا)؛ ئازاد.
(٥) بێ: ***( ~ from pain)***.
(٦) نادەقاودەق: ***( a ~ translation)***.
(٧) ئازاد: ***( ~ will)***.
(٨) دەستبەتاڵ؛ بێ ئیش‌وکار: ***( I will be ~ tomorrow.)***.
(٩) ڕەوان: ***( a ~ gait)***.

(١٠) (ا) دەستبڵاو *(a ~ spender)*.
(ب) فرە؛ زۆر؛ مشە.
(١١) لەڕوو؛ ئاشکرا؛ بێ شاردنەوەو پێچ‌وپەنا.
(١٢) ناشرین (دووان، ڕەووشت، کردار)؛ بێ شەرم.
(١٣) خۆڕایی؛ بەلاش؛ مفت: *(a ~ ticket, meal, etc.)*.
(١٤) ناقەدەغە (١٥) کراوە (ڕێگە)؛ ڕەوان: *(a ~ road ahead)*.
(١٦) کراوەتەوە بۆ هەموو کەس: *(a ~ market)*.
(١٧) بێ خاوەن.
(١٨) نەبەستراوە؛ بەرەڵا: *(the ~ end of a rope)*.
(١٩) گیرەی حێگۆڕکێکەر (دەنگناسی‌و زمانەوانی).
***adv.*** (١) خۆڕایی: بەخۆڕایی؛ بەلاش. (٢) ئازاد؛ بەرەڵا؛ ڕەوان.
(٣) بهات؛ هات؛ بەئامەد: *(a ~ wind)*.
***v.t.*** (١) ئازادکردن (بەند)؛ سەربەستی پێدان؛ سەرفرازکردن؛ بەردان؛ ڕزگارکردن.
(٢) بەرەڵاکردن؛ کردنەوە (گرێ)؛ لە ئاڵۆسکاوی ڕزگارکردن.

**free from (or of),** (١) بەبێ؛ بێ. (٢) لێ جیاکراوە؛ لێ ئازادکراو.
(٣) لە دەرەوەی؛ دوور لە.

**give (or have) a free hand,** دەسەڵاتی تەواو پێدان یا بوون (بۆ جووڵانەوە بەپێی ڕای خۆ)

**set free,** ڕزگارکردن؛ ئازادکردن؛ سەرفرازکردن؛ بەرەڵاکردن؛ بەردان.

**free alongside ship (or vessel),** دەدرێتە دەست خاوەنەکەی یا نێردەر لە بەندەر وە ئەویش پارەی گواستنەوەی دەدات (شتومەکێك کە بە کەشتی بگوێزرێتەوە).

**freebooter** (frē'bōōt'ẽr), ***n.*** چەتەی دەریا؛ تالانکەر؛ جەردە.

**freeborn** (frē'bôrn'), ***adj.*** بە ئازادی لەدایکبوو نەك بە بەندی.

**freedom** (frē'dəm), ***n.*** (١) ئازادی؛ سەربەستی؛ سەربەخۆیی؛ سەرفرازی؛ ڕزگاری. (٢) (ا) قسەلەڕوویی؛ لەڕوودا دانەمان.
(ب) ڕووکراوەیی لە ئەندازە بەدەر لەگەڵ کەسێکدا.
(٣) مافێکی تایبەتی (هی مرۆڤ، کۆمپانیا، یا شارێك).

**freedom of the press,** سەربەستی ڕۆژنامەگەری؛ ئازادی ڕۆژنامەگەری؛ سەربەستی بڵاوکردنەوە.

**free enterprise,** کاروکاسبی ئازاد (واتە بەبێ چاودێری میری لە ڕژێمی سەرمایەداریدا).

**free-for-all** (frē'fẽr-ôl'), ***n.*** (١) ململانێیەك یا لێکۆڵینەوەیەکی کراوە بۆ هەموکەس. (٢) دەمەقاڵێ یا شەڕێك کە گەلێك کەس تێیدا بەشداربێت.
***adj.*** کراوە بۆ هەموکەس؛ ناقەدەغە

**free-handed** (frē'han'did), ***adj.*** دەست‌و دڵ تێر؛ بەخشندە؛ بدە؛ دڵ فراوان؛ سەخی

**free-hearted** (frē'här'tid), ***adj.*** قسەلەڕوو؛ دڵ کراوە.

**free-lance** (frē'lans', frē'läns'), ***adj.*** سەربەست *(a ~ writer, photographer, etc.)*
***v.t.*** کارکردنی سەردەمی بۆ دەستگای جۆربەجۆر نەك بۆ یەك لا بە سەرومڕی.

**free lance,** (١) سەربازی بە کرێ گیراو.
(٢) کەسێکی سەربەست (واتە لەژێر دەستی هیچ لایەك یا ڕێکخراوێکدا نەبێ).
(٣) نووسەر یا هونەرمەندی ئازاد: کە هەرکات بیەوێ کاری سەردەمی دەکات بۆ دەستگای جۆربەجۆر نەك بۆ لایەك بە سەرومڕی.

**free liver,** کەسێك کە لە ئەندازە بەدەر خەریکی خواردن‌و خواردنەوەو ڕابواردنە؛ کەسێکی بەرەڵا.

**free-loader** (frē'lōd'ẽr), ***n.*** [Slang]. کەسێکی مفتەخۆر؛ مشەخۆر.

**free love,** ڕابواردن‌و جووت بوون بەبێ ژنهێنان‌و شووکردن

**freely** (frē'li), ***adv.*** (١) بە سەربەستی؛ بە سەربەستانە.
(٢) بەبێ زۆرەملێ؛ بە ئازادی.

**free-man** (frē'mən), ***n.*** (١) کەسێکی ئازاد، واتە کە بەند نەبێ.
(٢) هاوولاتییەك کە هەموو مافێکی ڕامیاری‌و شارستانێتی هەبێت.

**Freemason** (frē'mā's'n, frē'mā's'n), ***n.*** ماسۆنی؛ کەسێکی ماسۆنی.

**Freemasonry** (frē'mā's'n-ri, frē'mā's'n-ri), ***n.*** (١) ڕێبازی ماسۆنی. (٢) [f-]، هاوسۆزی.

**free on board,** فرۆشیار هەتا سەر کەشتی یا شەمەندەفەر دەیگەیەنێت (شتومەکی نێردراو).

**free port,** بەندەری ئازاد: کە باجی گومرگی تێدا ناسەنرێ.

**free-spoken** (frē'spō'kən), ***adj.*** قسەلەڕوو؛ لەڕوودا دانەماو

**free trade,** (١) بازرگانی ئازاد (بەتایبەتی جیهانی‌و بەبێ باجی گومرگی زیادە). (٢) [Archaic]، قاچاخچێتی.

**free verse,** هۆنراوەی ئازاد، واتە بەبێ دەستوور.

**freeway** (frē'wā'), ***n.*** (١) ڕێگایەکی پانی چەند هێڵی خێرای ئوتومبیلە کە ڕێگای تر نایبڕێ. (٢) ڕێگاوبانێکی وەهای بێ مزە.

**free-wheeling** (frē'hwēl'iŋ), ***adj.*** [Slang], بەرەڵا؛ ئازاد؛ بێ سنوور.

**free-will** (frē'wil'), ***adj.*** بە خۆشی خۆ؛ خواستی ئازاد؛ بێ زۆرەملێ.

**free will,** سەربەستی هەڵبژاردن‌و بڕیاردان؛ ویستی ئازاد؛ خواستی سەربەست.

**freeze** (frēz), ***v.i.*** (١) بەستن (سەرما)؛ بوون بە سەهۆڵ.
(٢) تەزین؛ سەرمابردن. (٣) ڕەق بوونەوە لە سەرمادا؛ مردن لە سەرمادا؛ لە گژ کەوتن. (٤) ووشك بوون؛ لە جووڵە کەوتن؛ ڕەق بوون.
***v.t.*** (١) بەستن؛ کردن بە سەهۆڵ. (٢) ساردکردن.
(٣) خواردن پاراستن بە خستنێیە ناو سەهۆڵ بەندانەوە.
(٤) ووشك کردن؛ لە جووڵە خستن. (٥) کوشتن بە سەرما؛ ڕەق کردنەوە.
(٦) [Colloq.]، وەستاندن لە پلەیەکدا (نرخ، مووچە، کرێ... هتد).
***n.*** (١) بەستن؛ بوون بە سەهۆڵ (٢) سەردەمێکی زۆر سارد؛ زوقم.
(٣) وەستان لە پلەیەکدا (نرخ، مووچە، کرێ).

**freeze over,** بە سەهۆڵ گرتن؛ بوون بە سەهۆڵ.

**freezer** (frēz'ẽr), ***n.*** سەهۆڵبەند؛ سەهۆڵدان.

**freezing point,** پلەی بەستن.

**freight** (frāt), ***n.*** (١) گواستنەوەی باری قورس بە کەشتی، فڕۆکە، یا شەمەندەفەر. (٢) کرێی ئەم بار گواستنەوەیە. (٣) باری گوێزراوە
(٤) شەمەندەفەری بار. (٥) بار؛ ئەرك.
***v.t.*** (١) بار لێ بارکردن. (٢) بار گواستنەوە.
-freightage *(n.)*.

**freight car,** فارگۆنی بار (لە شەمەندەفەردا).

**freighter** (frāt'ẽr), ***n.*** (١) بار بارکەرە ناو کەشتی. (٢) بار نێرەر.
(٣) کەسێك کە باری نێردراو وەردەگرێت‌و دەیگەیەنێت بە خاوەنەکەی.
(٤) کەشتی بار.

**freight house,** عەماری بار (پێش بارکردنی یا دوای داگرتنی).

**freight train,** شەمەندەفەری بار.

**French** (french), ***adj.*** فەرەنسی (زمان، گەل، کلتوور... هتد).
***n.*** زمانی فەرەنسی؛ فەرەنسی.

**the French,** گەلی فەرەنسا.

**French fried,** لە ڕۆنی قرچاودا سوورەوەکراوە تا ئاڵ بوون.

**French fries,** قاشی بارێکی پەتاتەی لە ڕۆنی قرچاودا سوورەوەکراو.

**French toast,** پارچە نانی لە هێلکەو شیر هەڵکێشراوو لە ڕۆندا سوورەوەکراوە.

**frenzied** (fren'zid), ***adj.*** شێتگیر؛ شپرزە.

**frenzy** (fren'zi), ***n.*** شێتگیری؛ شپرزەیی.

**frequence** (frē'kwəns), ***n.*** = **frequency.**

**frequency** (frē'kwən-si), ***n.*** (١) زۆر ڕوودان؛ زۆری ڕوودان.
(٢) ژمارەی ڕوودان (لە ماوەیەکی تایبەتیدا). (٣) لەرینەوە؛ لەرانەوە؛ لەرە.

**frequent** (frē'kwənt), ***adj.*** (١) زوو زوو ڕوودەدات؛ زۆر ڕوداو؛ زوو زوو. (٢) هەمیشەیی؛ باو: *(a ~ visitor)*.
***v.t.*** زوو زوو سەرلێدان (شوێن)؛ زوو زوو چوون بۆی.

*( She ~s the theatre.; to ~ a restaurant, bar, etc.)*
**frequentation** (frē´kwən-tā´shən), *n.* زۆر زۆر سەرلێدان.
**frequenter** (fri-kwen´tēr), *n.* زۆر زۆر سەرلێدەر؛ هەمیشە میوان.
**frequently** (frē´kwənt-li), *adv.* زۆر زۆر؛ زۆر جار؛ گەلێك جار؛ جارەها
**fresco** (fres´kō), *n.* (١) وێنەو نیگارکردن لەسەر دیواری گەچ. (٢) وێنەو نیگاری سەر دیواری گەچ.
*v.t.* وێنەو نیگارکردن لەسەر دیواری گەچ.
**fresh** (fresh), *adj.* (١) تازە (میوە، خواردن، خواردنەوە)؛ تەروبڕ؛ نوێ. (٢) بەهێز؛ چالاك. (٣) پاكو تازەو بە ڕەنگ. (٤) ڕووخسار گەنج؛ گەش *( a ~ complexion)*. (٥) تازە (دەنگوباس)؛ نوێ. (٦) لە سەرەوە؛ تازە؛ نوێ *( He made a ~ start.)*. (٧) نەوكەر؛ نەشارەزا. (٨) سازگار (ئاو، هەوا).
**fresh** (fresh), *adj.* [Slang], (١) لە ئەندازە بەدەر ڕووکراوە؛ چاوقایم؛ بێ شەرم. (٢) سەرخۆش.
**freshen** (fresh´ən), *v.t.* تازەکردنەوە؛ بووژانەوە.
*v.i.* (١) بووژانەوە؛ تازەبوونەوە. (٢) گوێرەکە بوون. (٣) هاتنە شیر (مانگا).
**freshet** (fresh´it), *n.* (١) جۆگەلە ئاوی سازگار (٢) هەستانی ئاوی جۆگەلەیەك بەهۆی تواندنەوەی بەفر یا باران بارینەوە.
**freshly** (fresh´li), *adv.* (١) بە تازەیی؛ بە نوێیی. (٢) هەر ئێستا؛ تازە *( bread ~ baked)*.
**freshman** (fresh´mən), *n.* (١) نەوکار؛ نەشارەزا؛ تازە (٢) قوتابییەکی پۆلی یەکەم لە زانکۆ، کۆلیج، یا قوتابخانەی ناوەندی. (٣) کەسێك کە ساڵی یەکەمی بێت لەسەر کارێك
*( Senator Smith is a ~ in Congress.)*
*adj.* تایبەتی بە قوتابی پۆلی یەکەمی زانکۆ یا قوتابخانە:
*( the ~ curriculum)*
**fret** (fret), *v.t.* (١) خور ـوە (خواردنەوە) (٢) سووواندن؛ بن کەن کردن. (٣) شێواندن؛ تێکدان *( The wind ~s the water.)*. (٤) پەستکردن؛ مەراق پێدان
*v.i.* (١) خورانەوە؛ بن کەن کردن (٢) سووان. (٣) شێوان؛ تێکچوون. (٤) پەست بوون؛ مەراق خواردن؛ نەسرەوتن؛ ماخولیان گرتن.
*n.* (١) خورانەوە؛ سووان. (٢) شوێنێکی سووواو (٣) پەستی؛ مەراق.
**fret** (fret), *n.* (١) شتێکی ڕازاوە کە ژن دەیان کردە سەریان (٢) نەخشی پەراوێز. (٣) نەخشی سەر دیوار
*v.t.* ڕازاندنەوە بە نەخش
**fret** (fret), *n.* چەند تەنێکە بە دەسکی عوودو گیتاردا کە پەنجەی دەخرێتە سەرو یاری پێ دەکرێت لە کاتی ژەنیندا.
**fretful** (fret´fəl), *adj.* تەنگەجیکلانە؛ جڕین؛ شپرزە.
**fret saw**, مشارێکی دەنووك وورده بۆ برینو نەخش لەسەرکردنی تەختەو تەبەقە کانزا
**fretwork** (fret´wŭrk´), *n.* پوویەکی بە نەخش ڕازاوە؛ نەخش.
**Fri**, = **Friday**.
**friar** (frī´ēr), *n.* قەشەی کاسۆلیك.
**friary** (frī´ēr-i), *n.* (١) پەرستگای کاسۆلیك. (٢) دەستە قەشەی کاسۆلیك کە لە پەرستگادا دەژین.
**fribble** (frib´'l), *adj.* هیچوپووچ؛ هیچ؛ بێ بایەخ.
*n.* (١) کەسێکی کات بەفیڕۆدەر. (٢) کردار یا بیری هیچوپووچ.
*v.i.* کات بەفیڕۆدان؛ ڕەفتاری هیچوپووچ نواندن.
**fricative** (frik´ə-tiv), *adj.* بە پاڵ پێوەنانی هەوا بەناو لێوو ددانی بە ئاستەم کراوەدا دەبێژرێت (وەك تیپی: **f, s, v, z**).
*n.* تیپێك کە وەها دەبێژرێت
**friction** (frik´shən), *n.* (١) لێکخشاندن؛ لەیەك سووان؛ لەیەکخستن؛ لەیەکدان؛ لەیەککەوتن. (٢) ناکۆکی؛ ڕێك نەکەوتن؛ نارێکی:
*( There is a lot of ~ between them.)*
**-frictional** *(adj.)*.
**Friday** (frī´di), *n.* هەینی؛ جومعە.
**fried** (frīd), *past tense and p.p. of* **fry**.
*adj.* (١) سوورەوەکراو. (٢) [Slang]، سەرخۆش.
**friend** (frend), *n.* (١) برادەر؛ هاوڕێ؛ ئاوەڵ؛ هەڤاڵ؛ دۆست. (٢) هاوپەیمان. (٣) هاوسۆز؛ دۆست.
*v.t.* [Rare], برادەرێتی کردن؛ هاوڕێیەتی کردن.
**be ( or make ) friends with**, برادەرێتی لەگەڵ گرتن؛ بوون بە هاوڕێ یا برادەر.
**friendless** (frend´lis), *adj.* بێ برادەر؛ بێ هاوڕێ؛ بێ کەس.
**friendliness** (frend´li-nis), *n.* ڕووخۆشی؛ هەستی دۆستانەو هاوڕێیەتی.
**friendly** (frend´li), *adj.* (١) دۆستانە؛ برادەرانە؛ برایانە. (٢) پاڵپشتیکەر؛ یارمەتیدەر. (٣) ڕووخۆش؛ ڕووکراوە؛ دەم بە پێکەنین.
*adv.* دۆستانە؛ بە دۆستانە؛ بە شێوەیەکی برادەرانە.
**friendship** (frend´ship), *n.* (١) برادەرێتی؛ هاوڕێیەتی؛ دۆستایەتی؛ ئاشنایەتی. (٢) هەستی برادەرێتی.
**frieze** (frēz), *n.* نەخشی ڕازێنەرەوەی سەر دیوارو پایە (خانووسازی).
**frieze** (frēz), *n.* قوماشێکی خوری ئەستوورە.
**frigate** (frig´it), *n.* کەشتییەکی جەنگی بچووکی خێرایە.
**fright** (frīt), *n.* (١) ترس؛ مەترسییەکی گەورە؛ سام؛ دڵەلەرزێ. (٢) دەعبا؛ کەسێك یا شتێکی زۆر ناشرین.
*v.t.* [Rare & Poetic], تۆقاندن؛ ترساندن.
**frighten** (frīt´'n), *v.t.* ترساندن؛ تۆقاندن.
*v.i.* ترسان؛ تۆقین.
**frightened** (frīt´'nd), *adj.* ترساو؛ تۆقیو؛ تۆقاو؛ ترس لێ نیشتوو.
**frightening** (frīt´'n-iŋ), *adj.* ستەم؛ تۆقێنەر؛ سامناك؛ ترسناك؛ پڕ مەترسی.
**frightful** (frīt´fəl), *adj.* (١) تۆقێنەر؛ سامناك؛ ستەم؛ ترسناك. (٢) پیسوناخۆش. (٣) [Colloq.]، (ا) ناخۆش؛ پەستکەر. (ب) ئێجگار.
**-frightfully** *(adv.)*.
**frigid** (frij´id), *adj.* (١) زۆر سارد (ئاووهەوا)؛ سارد. (٢) سارد (مرۆڤ)؛ بێ هەست. (٣) بێ هەوەسی جووت بوون (ئافرەت)؛ ساردەو ئاوی نایەتەوە (ئافرەت).
**frigidaire** (frij´i-dâr´), *n.* سەهۆڵدان؛ ساردکەری ئەلەکتریکی؛ یەخچاڵ؛ بەفرگر.
**frigidity** (fri-jid´ə-ti), *n.* (١) ساردی؛ زۆر ساردی. (٢) ساردیو بێ هەستی؛ ئاو نەهاتنەوە (ئافرەت).
**frill** (fril), *n.* (١) پەڕ یا تووکی ملی باڵندەو گیانداران. (٢) [Colloq.]، شتی ڕازاندنەوەی پێ نەویستی هەر بۆ خۆنواندن. (٣) پەراوێزی نەخشدار؛ چرچولۆچی ڕازاندنەوە. (٤) چرچ بوونی قەراغی فیلم.
**fringe** (frinj), *n.* (١) گێزوگوڵنگ. (٢) قەراغ؛ پەڕ؛ سنوور؛ لێوار؛ پەراوێز *( the ~s of civilization)*.
*v.t.* (١) بە گێزوگوڵنگ ڕازاندنەوە. (٢) دەورەدان؛ دەورگرتن.
*adj.* قەراغ؛ پەراوێز؛ پەڕ؛ لێوار.
**fringe benefit**, (١) دەسکەوتی لە مووچە بەولاوە (بەخشیش، پشوو، جەژنانە، بیمەی ژیان). (٢) دەسکەوتی لەلاوە یا زیادە.
**frippery** (frip´ēr-i), *n.* (١) جلوبەرگی هەرزانو ڕەنگ زەق. (٢) تەڕپۆشی؛ خۆنواندن لە بەرگو کردەوەو دوواندا.
**frisk** (frisk), *adj.* سرك.
*n.* یاریو جووتەمەڵدان؛ هەڵتوزان؛ کلکەلەقێ.

*v.t.* (۱) کلکەلەقێ کردن؛ هەلتوزان؛ یاری کردن‌و جووتەهەلدان:
*( The puppy ~ed its tail.)*
(۲) [Slang]، پشکنینی کەسێك (بۆ چەك یا شتی قەدەغە).
(۳) [Slang]، لێ دزینی شتێك لە کاتی پشکنینی کەسێکدا.
*v.i.* یاری کردن‌و جووتەهەلدان؛ هەلتوزان.
-**friskily** *(adv.)*; **friskiness** *(n.)*.

**frisky** (fris′ki), *adj.* سرك؛ بزێو؛ بە حۆش‌و حەز لە یاری کەر.

**fritter** (frit′ēr), *n.* [Rare], پارچە؛ لەت؛ کەرت
*v.t.* (۱) [Rare]، پارچە پارچە کردن.
(۲) ( ~ away )، بەفیڕۆدان (کات، پارە، ووزە).

**frivol** (friv′'l), *v.i. & v.t.* [Colloq.], کات بەفیڕۆدان؛ کات کوشتن.

**frivolity** (fri-vol′ə-ti), *n.* (۱) هیچ‌وپووچی (کردەوە، ڕەووشت)؛ بە لامسەرلایی یا فشقی دانەبەر. (۲) کردەوەیەك یا شتێکی هیچ‌وپووچ.

**frivolous** (friv′ə-ləs), *adj.* (۱) هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ: *( a ~ act)*.
(۲) لامسەرلا؛ فشقی؛ بە سووکی گر؛ هیچ‌وپووچ: *( a ~ person)*.

**friz** (friz), *v.t. & v.i.* (۱) لوول کردن (قژ)؛ لوول بوون.
(۲) گرێ گرێ وەستان (قوماش).
*n.* قژی لوول.

**frizz** (friz), *v.t. & v.i.* قرچەقرچ کردن (سوورکردنەوەی خواردەمەنی)؛ قرچاندن؛ قرچەهاتن

**frizzle** (friz′'l), *v.t. & v.i.* (۱) قرچەقرچ لێ هەلسان (سوورکردنەوەی خواردەمەنی)؛ قرچەهاتن.
(۲) سوورکردنەوەو ئاڵ کردن؛ سوورکردنەوەو ئاڵ بوون.

**frizzly** (friz′li), *adj.* لوول (قژ)

**frizzy** (friz′i), *adj.* = frizzly.

**fro** (frō), *adv.* بۆ دواوە: *( to and ~ )*.
**to and fro,** بۆ پێشەوەو بۆ دواوە؛ هاتن‌وچوون.

**frock** (frok), *n.* کەوا یا ڕۆبی قەشە
*v.t.* کەوا یا ڕۆبێکی وەها لەبەرکردن.

**frog** (frôg, frog), *n.* (۱) بۆق. (۲) قوڵفەیەکی نەخشدار بە جلەوە بۆ جوانی یا بەستن. (۳) ئامێری گۆڕینی شەمەندەفەر بۆ هێڵی تایبەتی خۆی لە چوار ڕێیاندا. (٤) [Slang]، کەسێکی فەرەنسی (لەڕووی سووکییەوە).
**frog in the throat,** دەنگ نووسان

**froggy** (frôg′i, frog′i), *adj.* (۱) بۆق ئاسا؛ وەك بۆق. (۲) پڕ لە بۆق.

**frolic** (frol′ik), *adj.* بە کەیف؛ حەز لە یاری کەر؛ خۆش
*n.* (۱) گاڵتەوگەپ؛ گاڵتە. (۲) ئاهەنگێك یا یارییەکی خۆش؛ یاری.
(۳) خۆشی؛ کەیف؛ ڕابواردن.
*v.i.* هەڵتووزاندن لە خۆشیدا؛ سەماکردن لە خۆشیدا؛ گاڵتەوگەپ کردن؛ ڕابواردن؛ یاری کردن
-**frolicker** *(n.)*; **frolicky** *(adj.)*.

**frolicksome** (frol′ik-səm), *n.* بە جۆش‌وخرۆش؛ حەز لە یاری‌و سەما کەر

**from** (frum, from), *prep.* (۱) لە (شوێن):
*( He walked ~ home.)*
(۲) لە (کات): *( I stayed ~ Monday to Friday.)*.
(۳) لە (دەرهێنان لە شوێنێك): *( He took a comb ~ his pocket.)*.
(٤) لە (شت یا مرۆڤەوە)؛ لەلایەن:
*(facts learned ~ reading; a letter ~ Mary)*
(٥) لە (شوێن، دووری): *( She is far ~ home.)*.
(٦) لە (لێ دەرکردن، ژمارە): *( Take two ~ four.)*.
(۷) لە (قەدەغەکردن): *( He kept me ~ going.)*.
(۸) لە (بەرەڵاکردن لە شوێنێك): *( They released him ~ jail.)*.
(۹) لە (جیاکردنەوە لە، ناسینەوە): *( He didn't know me ~ Adam.)*.
(۱۰) لە؛ بەهۆی: *( He trembled ~ fear.)*.

**frond** (frond), *n.* گەڵایەکی هەمە پەڕ (وەك هی دارخورما).

**frondescent** (fron-des′ənt), *adj.* پڕ لە گەڵا؛ گەڵای زۆرە.
-**frondescence** *(n.)*.

**front** (frunt), *n.* (۱) ناوچەوان. (۲) دەم‌وچاو؛ ڕوو؛ ڕووخسار.
(۳) ڕووالەت؛ ڕوو: *( He puts on a bold ~ inspite of his fears.)*.
(٤) بێ شەرمی؛ بێ حەیایی.
(٥) پێشەوە؛ پێش؛ ڕوو؛ بەر. (٦) سەرەتا.
(۷) بەردەم؛ لە بەردەم: *( It's right in ~ of you.)*.
(۸) زەوی‌وخانووی قەراغ ڕووبار، دەریا، یا شەقام.
(۹) پێشەنگ؛ بەرایی جەنگ.
(۱۰) بەرە: یەکگرتنی چەند حیزب‌و ڕێکخراوێك بۆ ئامانجێکی تایبەتی.
(۱۱) کەسێکی ناودار کە دەبێت بە نوێنەری دیاری کۆمەڵ یا دەزگایەك.
(۱۲) کەسێك، دەستە یا دەزگایەك کە دەبێت بە ڕووالەتی دەستە یا دەزگایەکی تر بۆ داپۆشینی ئامانج‌و کاری ڕاستەقینەی ئەو دەستە یا دەزگایە.
(۱۳) [Colloq.]، ڕووالەت؛ خۆدەرخستنی درۆ.
(۱٤) ڕوو یا بەشی پێشەوەی خانوویەك.
*adj.* (۱) لەپێشەوە؛ بۆ پێشەوە؛ هی پێشەوە؛ پێشەوە.
(۲) بە سەری زمان دەبێژرێ (دەنگناسی).
(وەك تیپی i, e لە وشەی bid, met دا).
*v.t.* (۱) بەرەو ڕوو وەستان. (۲) لە بەردەمدا بوون؛ لەپێشەوەیدا بوون.
(۳) پێ گەیشتن. (٤) بەرهەڵستی کردن.
(٥) ڕووالەت پیشاندان
*v.i.* بەرەو لایەك بوون (خانوو).
**in front of,** لەبەردەم؛ لەپێش.

**frontage** (frun′tij), *n.* (۱) ڕووی خانوویەك؛ دیوی پێشەوەی خانوو.
(۲) ئەو لایەی دیوی پێشەوەی خانوویەك ڕووی تێ دەکات.
(۳) حەوشە یا چیمەنی بەردەمی خانوو؛ زەمینی نێوان خانوو شەقام.
(٤) زەمینی قەراغ ڕووبار، دەریاچە، یا شەقام.

**frontal** (frun′t'l), *adj.* (۱) پێشەوە؛ هی پێشەوە؛ هی بەردەم؛ لەپێشەوە. (۲) ناوچەوانی؛ تایبەتی بە ناوچەوان.
*n.* ئێسقانی ناوچەوان.

**frontal** (frun′t'l), *n.* (۱) شریتێك کە بە ناوچەوانەوە دەبەسترێت یا قەڵغانی سەرو دەم‌وچاو. (۲) پەردەی سەر قوربانگا (کڵێسە).
(۳) (ا) ڕوو؛ ڕووالەت. (ب) تاقێکی سێگۆشەیی بچووکی سەر پەنجەرە یا دەرگایەك (خانووسازی).

**frontal attack,** (۱) هێرشی پێشەوە (جەنگ)؛ هێرشی سەر پێشەنگی سوپای دوژمن. (۲) هێرشی ڕاستەوخۆ.

**frontier** (frun-têr′, fron′têr), *n.* (۱) سنوور (وڵات).
(۲) بەشی ئاوەدان نەکراوەی نزیك سنووری وڵاتێك.
(۳) بەشی نەزانراوی زانیاری: *( the ~s of medicine)*.

**frontiersman** (frun-têrz′mən), *n.* دانیشتووی بەشی ئاوەدان نەکراوەی وڵات؛ نیشتەنی نزیك سنوور.

**frontispiece** (frun′tis-pēs′, fron′tis-pēs′), *n.* (۱) (ا) لاپەڕەی یەکەمی پەڕتووکێك. (ب) سەرەتا (پەڕتووك). (۲) وێنەی بەرامبەری لاپەڕەی پەڕتووکێك. (۳) (ا) ڕووی پێشەوەی خانوویەك. (ب) تاقێکی سێگۆشەیی بچووکی سەر پەنجەرە یا دەرگا.

**frontlet** (frunt′lit), *n.* (۱) شریتی ناوچەوان.
(۲) ناوچەوانی گیاندار یا باڵندە.
(۳) سنووری ڕازاوەی قوربانگا (کڵێسە).

**front-page** (frunt′pāj′), *adj.* لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەدا چاپکراو؛ گرنگ؛ سەرنج ڕاکێش: *( ~ news)*.

**front room,** ژووری پێشەوەی ماڵ؛ ژووری میوان.

**frosh** (frosh), *n.* [Slang], قوتابی پۆلی یەکەمی زانکۆ، کۆلێج، یا قوتابخانە.

**frost** (frôst, frost), *n.* (۱) بەستن؛ بوون بە زوقم. (۲) پلەی بەستن.
(۳) زوقم. (٤) ساردی (هەست).

(٥) [Slang]، شتێکی سەرنەکەوتوو (ئاهەنگ، شانۆگەری).

***v.t.*** (١) بە زوقم داپۆشین؛ بە زوقم گرتن.

(٢) بە زوقم فەوتاندن (ڕووەك)؛ زوقم لێدان.

(٣) داپۆشینی کێك بە کرێمێکی سپی.

**frost-bite** (frôst′bīt´, frost′bīt´), ***n.*** سەرمابردن (مرۆڤ، ڕووەك)؛ سەرمالێدان.

**-frostbitten** ***(adj.).***

**frosting** (frôs′tiŋ, fros′tiŋ), ***n.*** کرێمی سپی سەر کێك.

**frosty** (frôs′ti, fros′ti), ***adj.*** (١) زۆر سارد؛ سارد وەك سەهۆڵ.

(٢) بە زوقم داپۆشراو؛ زوقم گرتوو. (٣) سارد (هەست، ڕەووشت).

(٤) سەرسپی. (٥) (أ) پیر. (ب) هی پیری.

**-frostily** ***(adv.)***; **frostiness** ***(n.).***

**froth** (frôth, froth), ***n.*** (١) کەف. (٢) شتێکی هیچوپووچ و بێ بایەخ.

***v.t.*** (١) کەف پێکردن. (٢) بە کەف داپۆشین.

**frothy** (frôth′i, froth′i), ***adj.*** (١) کەفاوی؛ کەفی؛ بە کەف داپۆشراو.

(٢) هیچوپووچ؛ بێ نرخ.

**-frothily** ***(adv.)***; **frothiness** ***(n.).***

**frown** (froun), ***v.i.*** (١) ناوچەوان گرژکردن؛ خۆ مۆن کردنەوە.

(٢) ( ~ on; ~ upon )، پەسەند نەکردن؛ بە دڵ نەبوون.

***v.t.*** (١) ( ~ down )، دەمکوت کردن بە سەیرکردنێکی پەسەند نەکردنەوە.

(٢) ناوچەوان گرژکردن؛ مۆن بوونەوە.

***n.*** (١) ناوچەوان گرژی؛ گرژی؛ مۆنی؛ مۆن بوونەوە.

(٢) پەسەند نەکردن؛ بە دڵ نەبوون.

**frowzy** (frou′zi), ***adj.*** (١) [Rare]، بۆگەن.

(٢) پیس و پۆخڵ؛ پیس؛ چەپەڵ.

**froze** (frōz), *past tense of* **freeze.**

**frozen** (frō′z'n), *past participle of* **freeze.**

***adj.*** (١) بەستوویەتی وەك سەهۆڵ؛ بەستوو.

(٢) ڕەق بووەوە؛ تەزیو؛ لە گۆ چوو.

(٣) بەستوویەتی لەناو سەهۆڵدانێدا (خواردەمەنی).

(٤) ووشك بوو (لە ترسدا)؛ سڕ دەبێت (لە ترسدا): ***( ~ with terror)*** .

(٥) سارد. هەست؛ هەست مردوو.

(٦) دەست بە سەردا گیراو (سامان): ***( ~ assets)*** .

(٧) وەستاو (نرخ، مووچە... هتد): ***( Salaries were ~ .)***

**fructiferous** (fruk-tif′ẽr-əs), ***adj.*** بەردار؛ بە بەر.

**fructose** (fruk′tōs, frook′tōs), ***n.*** شەکری میوە و هەنگوین.

**frugal** (froō′g'l), ***adj.*** (١) گیر؛ پارە بەفیڕۆنەدەر؛ دەست بە پارەوە گر؛ دەست نوقاو. (٢) (أ) هەرزانبەها. (ب) کەم.

**frugality** (froō-gal′ə-ti), ***n.*** گیری؛ پارە بەفیڕۆنەدان؛ دەست بە پارەوە گرتن؛ دەست قووچاوی.

**fruit** (froōt), ***n.*** (١) *(pl.)* . بەر؛ بەروبووم.

(٢) میوە؛ میوەهات. (٣) بەرهەم؛ ئەنجام: ***( the ~ of his work)*** .

(٤) [Archaic]، بەچە؛ بەچکە (مرۆڤ، گیاندار).

***v.i.*** بەرگرتن؛ هاتنەبەر

***v.t.*** هێنانەبەر

**fruitage** (froōt′ij), ***n.*** (١) بەرگرتن؛ هاتنەبەر.

(٢) میوە؛ بەر؛ بەری وەرزێك. (٣) بەرهەم؛ ئەنجام؛ بەروبووم.

**fruiter** (froōt′ẽr), ***n.*** (١) باخەوان؛ بێستانەوان.

(٢) داری بەردار.

(٣) کەشتی میوە گوێزەرەوە.

**fruiterer** (froōt′ẽr-ẽr), ***n.*** (١) [Chiefly British]، میوەفرۆش.

(٢) کەشتی میوە گوێزەرەوە.

**fruit fly,** مێرووی میوە (کە قۆزاخەکەی لەسەر میوە و سەوزە دەژی و دەیفەوتێنێ)

**fruitful** (froōt′fəl), ***adj.*** (١) بەبەر؛ بەردار؛ بەبرشت.

(٢) بە بەرهەم؛ بەکەڵك؛ بەسوود؛ ئەنجام بەخش: ***( a ~ plan)***

**fruition** (froō-ish′ən), ***n.*** (١) خۆشی.

(٢) بەرگرتن؛ هاتنەبەر؛ هاتنە بەرهەم؛ بەر:

***( Success was the ~ of his years of work .)***

**fruitless** (froōt′lis), ***adj.*** (١) بێ سوود؛ بێ کەڵك؛ بێ ئەنجام.

(٢) بێ بەر؛ نەزۆك.

**-fruitlessness** ***(n.).***

**fruit tree,** داری بەردار؛ درەختی بەرگر یا بەبەر.

**fruity** (froōt′i), ***adj.*** . (١) میوەیی؛ تام خۆش وەك میوە: ***( a ~ wine)***

(٢) خۆش (دەنگ)؛ ساز: ***( a ~ voice)*** .

(٣) [Colloq.]، تەڕوبڕ؛ خۆش: ***( a ~ story)*** .

**frump** (frump), ***n.*** ئافرەتێکی پیس و پۆخڵی تەنگەجیکلانە.

**frumpish** (frump′ish), ***adj.*** = **frumpy.**

**frumpy** (frump′i), ***adj.*** پیس و پۆخڵ و تەنگەجیکلانە (ئافرەت).

**frustrate** (frus′trāt), ***v.t.*** (١) کۆسپ خستنەڕێ؛ بەزاندن؛ تێکشکاندن؛ پەنگ پێ خواردنەوە؛ ژێرخستن: ***( He ~d our plans.)*** .

(٢) دیق پێکردن؛ نائومێدکردن؛ بێزارکردن.

**frustrated** (frus′trāt´id), ***adj.*** وەڕس؛ بێزار؛ پەست؛ نائومێد.

**frustration** (frus-trā′shən), ***n.*** بێزاری؛ وەڕسی؛ پەستی؛ پەست بوون؛ نائومێدی؛ نامرادی.

**fry** (frī), ***v.t.*** (١) سوورکردنەوە (خواردەمەنی).

(٢) [Obs.]، چەوساندنەوە؛ پەستکردن؛ تووڕەکردن.

***v.i.*** (١) سووربوونەوە. (٢) [Obs.] ، تووڕەبوون.

**fry** (frī), ***n.*** (١) بەچکە ماسی. (٢) ماسی بچووك.

(٣) بەچکە؛ بەچە؛ منداڵ؛ لاو.

**small fry,** (١) منداڵ؛ منداڵان. (٢) هیچوپووچ و بێ بایەخ (مرۆڤ، شت).

**fryer** (frī′ẽr), ***n.*** (١) سوورکەرەوە (مرۆڤ، دەفر، شت).

(٢) خواردنێك کە بۆ سوورکردنەوە باش بێت وەك مریشك.

**frying pan,** تاوە.

**out of the frying pan into the fire,** لە بارێکی خراپەوە بۆ خراپتر.

**fuddle** (fud′'l), ***v.t.*** سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان.

***n.*** بارێکی شێواو.

**fuddy-duddy** (fud′i-dud´i), ***n.*** [Slang]. (١) کەسێکی هەمیشە ڕەخنەگری بە هیچ ڕازی نەبوو. (٢) کەسێکی کۆنەپەرست؛ کەسێکی کۆنەباو.

**fudge** (fuj), ***n.*** (١) قسەی درۆ یا هەڵبەستراو؛ قسەی قۆڕ و بێ تام و هیچوپووچ. (٢) جۆرە نوقڵ یا شیرینییەکە.

(٣) دوا دەنگوباسی بە ڕەنگاوڕەنگ چاپکراو لە ڕۆژنامەیەکدا.

***interj.*** قسەی قۆڕ و هیچوپووچ.

***v.t.*** بە لامسەرلایی و هەر بە درۆوە کردن.

**fuel** (fū′'l), ***n.*** (١) سووتەمەنی (نەوت، دار، خەڵووز، بەنزین).

(٢) ئاگرخۆشکەر (هەست، کردار، کردەوە).

***v.t.*** سووتەمەنی تێکردن یا تێخستن؛ ئاگر خۆشکردن (بە ڕاستی و بە مەجازی): ***( to ~ the fire)***

**-fueler; fueller** ***(n.).***

**fugacious** (fū-gā′shəs), ***adj.*** (١) کەم خایەن؛ زوو لەناوچوو؛ سەردەمی؛ کاتی. (٢) زوو وەریو (گەڵا).

**fugitive** (fū′jə-tiv), ***adj.*** (١) هەڵاتوو؛ ڕاکردوو؛ قاچاخ.

(٢) کەم خایەن؛ سەردەمی؛ زوو لەناوچوو. (٣) هەمیشە گۆڕاو.

***n.*** (١) کەسێکی هەڵاتوو، قاچاخ، یا ڕاکردوو بەهۆی تاوانکارییەوە

(٢) شتێکی زوو لەناوچوو، کەم خایەن، یا سەردەمی.

**fugleman** (fū′g'l-mən), ***n.*** (١) سەربازی نموونە، کە ئەوەندە لە مەشقدا باشە لە سەرەتای ڕیزدا دەوەستێ تا ئەوانی تر چاوی لێ بکەن؛ سەربازی سەرمەشق. (٢) نموونە؛ سەردار.

**fulcrum** (ful′krəm), ***n.*** (١) ڕاگرە؛ ئەو خاڵەیە سەری نوێڵی لەسەر دادەنرێ بۆ بەرزکردنەوەی شت. (٢) هۆی زۆرلێکردن؛ هۆی زەبر خستنەسەر

**fulfill, fulfil** (fool-fil′), *v.t.* (١) هێنانەدی؛ بەجێهێنان؛ کردن؛ جێبەجێکردن. (٢) پەیڕەوی کردن؛ بە گوێ کردن. (٣) تەواوکردن
**fulfill oneself,** ئاوات و ئامانجی خۆ هێنانەدی.
**fulfillment, fulfilment** (fool-fil′mənt), *n.* (١) بە ئاوات گەیشتن؛ بە ئامانج گەیشتن؛ ئاوات هێنانەدی یا هاتنەدی
(٢) ئاوات هێنەرەدی
**fulgent** (ful′jənt), *adj.* [Poetic], گەش؛ بریقەدار؛ بریقاوە.
**full** (fool), *adj.* (١) پڕ؛ لێیاولێو. *( The glass is ~ .)*
(٢) تێر؛ مر. (٣) پڕ؛ پڕ لە: *( a room ~ of people)* .
(٤) تەواو: *( a ~ load)* .
(٥) تەواو؛ هیچی کەم نییە: *( a ~ dozen)* .
(٦) پڕ؛ تەواو: *( a ~ moon; ~ speed)* .
(٧) تەواو؛ هەمووی: *( a ~ view)*
(٨) خڕوپڕ؛ پڕ؛ قەڵەو: *( a ~ face)* .
(٩) ڕەبەق؛ تەواو *( two ~ years)* .
*n.* ئەوپەڕ؛ پڕ؛ زۆرترین.
*adj.* (١) بەتەواوی؛ تەواو: *( a ~ - grown boy)* .
(٢) یەکسەر؛ بەتەواوی: *( The blow landed ~ in his face.)* .
**full of,** (١) پڕ؛ پڕ لە؛ پڕە لە. (٢) تێر. (٣) خەریک؛ سەرنج ڕاکێشراو.
**full well,** زۆرباش؛ باش؛ تەواو.
**in full,** (١) بەتەواوی؛ هەمووی. *( to pay in full)* .
(٢) کورت نەکراوە (ووشە): *( to write the word in full)* .
**to the full,** بەتەواوی؛ هەمووی.
**full blood,** (١) برایەتی؛ خوشکایەتی.
(٢) توخمی ڕەسەن
**full-blooded** (fool′blud′id), *adj.* (١) بەهێز؛ تەڕوبڕ
(٢) ڕەسەن
**full-blown** (fool′blōn′), *adj.* (١) گەشاوە (گوڵ)؛ کراوە (گوڵ).
(٢) پێگەیشتوو؛ کامڵ؛ گەورەبوو.
**full-dress** (fool′dres′), *adj.* (١) تایبەتی بە جلی ڕەسمیی:
*( a ~ suit)*
(٢) ڕەسمیی: *( a ~ dinner)* .
**full dress,** جل‌وبەرگێک کە لە بۆنەی ڕەسمیدا لەبەر دەکرێت.
**full-faced** (fool′fāst′), *adj.* (١) دەموچاو خڕ؛ دەموچاو پڕ؛ قەڵەو.
(٢) دەموچاوی هەمووی دیارە (وێنە).
**full-fledged** (fool′flejd′), *adj.* (١) پەڕو باڵ دەرکردوو؛ باڵفڕە؛ باڵەفڕی بوو. (٢) پێگەیشتوو؛ گەورەبوو؛ کامڵ؛ تەواو:
*( a ~ teacher, manager, member, etc.)*
**full-grown** (fool′grōn′), *adj.* پێگەیشتوو؛ کامڵ؛ گەورەبوو.
**full-length** (fool′leŋth′), *adj.* (١) هەمووبەرخەر
(٢) ئاوداماڵ؛ هەموو لەش دەرخەر یا داپۆشەر:
*( a ~ picture, mirror, etc.)*
(٣) کورت نەکراوە؛ تەواو؛ هەمووی بە تەواوی: *( a ~ novel)* .
**full moon,** مانگی چواردە شەوە؛ مانگی پڕ.
**fullness** (fool′nis), *n.* پڕی؛ تەواوی.
**fullness of time,** لە کاتی خۆیدا؛ لە کاتی دیاریکراودا.
**full professor,** مامۆستای تەواوی زانکۆ (بەرزترین پلەی مامۆستایەتییە لە زانکۆدا).
**full sail,** (١) بە هەموو بایەوانەکانەوە. (٢) بە ئەوپەڕی توانا و خێراییەوە.
**full stop,** خاڵ (لە کۆتایی ڕستەدا).
**full swing,** ئەوپەڕی توانا و چالاکی.
**full tilt,** بە هەموو هێزێکەوە؛ ئەوپەڕی خێرایی.
**full-time** (fool′tīm′), *adj.* سەرومر (کارکردن، فەرمان):
*( He has a ~ job.; a ~ teacher)*
**fully** (fool′i), *adv.* (١) بەتەواوی؛ تەواو؛ هەمووی.

(٢) بەبێ کەموزیاد. (٣) ئێجگار زۆر؛ فرە.
(٤) بەلای کەمەوە.
**fulminate** (ful′mə-nāt′), *v.i.* (١) [Rare] ، چەخماخەو هەورەتریشقە دان. (٢) تەقینەوە (لە تووڕەییدا)؛ تەقین.
(٣) قیژاندن (لە تووڕەییدا).
*v.t.* (١) تەقاندنەوە. (٢) قیژاندن و جوێن دان.
*n.* تەقەمەنی.
**-fulmination** ***(n.)*; fulminator *(n.)*.**
**fulsome** (fool′səm, ful′səm), *adj.* ناشرین و قێزهێنەرەوە (ستایشی درۆو بێ ئەندازە، مەرایی): *( ~ flattery)* .
**fumble** (fum′b'l), *v.i. & v.t.* (١) بۆ گەڕان بە ناقۆڵایی و کەمژەیی؛ دەست پێدا گێڕان (گیرفان)؛ دەست بۆ کوتان: *( to ~ for a key)*
(٢) بەدەستەوەگرتن بە ناکارامەیی.
(٣) کردنی کارێک بە ناقۆڵایی و ناکارامەیی؛ زمان گیران و هەڵەکردن:
*( He ~ed throgh his speech.)*
(٤) تۆپ نەگرتنەوە (یاری فوتبۆڵی ئەمەریکی).
*n.* (١) پەل کوتان؛ دەست بۆ کوتان بە ناقۆڵایی. (٢) تۆپ نەگرتنەوە.
**-fumbler *(n.)*.**
**fume** (fūm), *n.* (١) دووکەڵ؛ چڕە دووکەڵ؛ دووکەڵێکی بۆگەن و هەناسە سوارکەر. (٢) شتێک کە تەنها هەر لە خەیاڵدا هەبێ و بوونی نەبێ.
(٣) [Rare]، تووڕەیی؛ زۆر پەستی.
*v.i.* (١) چڕە دووکەڵ لێ هاتنەدەرەوە؛ دووکەڵ لێ هەڵسان.
(٢) زۆر تووڕەبوون؛ هەڵچوون.
*v.t.* چڕە دووکەڵ لێدان یا پیاکردن؛ پاککردنەوە بە دووکەڵ (بۆ کوشتنی جانەوەر).
**fumigate** (fū′mə-gāt′), *v.t.* (١) کوشتنی جانەوەر لە ماڵ، باخ، یا بێستاندا بە دووکەڵی کیمیایی تایبەتی؛ پاککردنەوە لە جانەوەر بە چڕە دووکەڵ؛ قانگدان. (٢) [Rare or Archaic]، بۆن خۆش کردن.
**-fumigation *(n.)*; fumigator *(n.)*.**
**fumy** (fūm′i), *adj.* پڕ لە دووکەڵ؛ دووکەڵی لێ دەبێتەوە؛ تەم‌ومژاوی؛ دووکەڵاوی.
**fun** (fun), *n.* خۆشی؛ ڕابواردن؛ کەیف؛ یاری؛ گاڵتەوگەپ؛ قۆشمە؛ سەیر.
*adj.* [Colloq.], خۆش؛ قۆشمە: *( a ~ movie)* .
**for ( or in ) fun,** بۆ گاڵتە؛ بە گاڵتەوە؛ بۆ کەیف و ڕابواردن؛ بۆ سەیر.
**have fun,** ڕابواردن؛ خۆش ڕابواردن؛ کات بە خۆشی بردنەسەر.
**make fun of,** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.
**funambulist** (fyoo-nam′byoo-list), *n.* تەنافباز.
**function** (fuŋk′shən), *n.* (١) کار؛ ئیش؛ کردار.
(٢) ئەرکی سەرشان؛ ئەرک:
*( The ~ of a policeman is to protect and assist the public.)*
(٣) پیشە. (٤) ئاهەنگ.
(٥) ژمارەیەکی گۆڕاو (بیرکاری).
*v.i.* کارکردن؛ ئیش کردن؛ بەکارهاتن؛ بەکەڵک هاتن.
**functional** (fuŋk′shən-'l), *adj.* (١) هی کار؛ هی ئەرک.
(٢) بەکاردێت؛ کاردەکات؛ باش کاردەکات.
**-functionalism *(n.)*.**
**functionally** (fuŋk′shən-'l-i), *adv.* لە ڕووی کارکردن، ئەرک بەجێهێنان یا بەکارهاتنەوە.
**functionary** (fuŋk′shən-er′i), *n.* فەرمانبەر؛ مووچەخۆر؛ کاربەدەست.
**fund** (fund), *n.* (١) ئازووقە: *( a ~ of good humor)* .
(٢) (ا) هەندێ پارەی تەرخان کراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی: *( orphans' ~ )*
(ب) *(pl.)*، پارەی ئامادە بۆ خەرج کردن؛ پارە.
(٣) *(pl.)*، [British] ( the ~ )، قەرزی فەرمانڕەوایی ئینگلیزی.
(٤) دەزگای بەڕێوەبردنی پارەی تەرخان کراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی.

*v.t.* (١) پارە دانان بۆ دانەوەی سوودی قەرزێك
(٢) گۆڕینی قەرزێکی ماوە کورت بۆ ماوە درێژو سوود لێ وەرگرتنی.
(٣) پارەکۆکردنەوەو خستنێیە شوێنێکی تایبەتی.
(٤) پارەپێدان یا لەسەر سەرف کردن: *( to ~ cancer research)* .
**fundamental** (fun´də-men′t'l), *adj.* (١) بنچینەیی؛ بناغەیی؛
ریشەیی؛ بنەڕەتی؛ پێویست (٢) هی نزمترین دەنگ (مۆسیقاناسی).
*n.* (١) بناغە؛ بنچینە؛ بنەڕەت. (٢) دەنگی بنچینە یا نزم (مۆسیقاناسی).
**fundamentalism** (fun´də-men′t'l-iz'm), *n.* (١) بڕوا بوونی
کوێرانە بە هەموو ناوەڕۆکی ئینجیل وەك چۆنێتی درووستبوونی جیهان و
ئادەم و حەوار بەهەشت و دۆزەخ. (٢) بڕوابوون بەم بیروباوەڕە.
**fundamentalist** (fun´də-men′t'l-ist), *n.* کوێر بڕوا (بەتایبەتی
بە هەموو شتێك کە لە ئینجیلدا نووسراوە)؛ کەسێك کە بە توندوتیژی بڕوای بە
ڕێبازێك هەبێ بەتایبەتی هی ئاینی.
*adj.* تایبەتی بە کوێر بڕوا.
**fundamentally** (fun´də-men′t'l-i), *adv.* لە ڕووی بنچینەوە؛
بە شێوەیەکی بناغەیی؛ لە ڕووی ئەو شتانەوە کە بنچینەیین.
**funeral** (fū′nēr-əl), *adj.* تایبەتی بە پرسە؛ هی پرسە؛ غەمگین.
*n.* پرسە؛ مردوو ناشتن.
**funerary** (fū′nēr-er´i), *adj.* تایبەتی بە پرسەو مردوو ناشتن
**funereal** (fū-nêr′i-əl), *adj.* غەمگین؛ ناخۆش وەك پرسە.
**fungal** (fuŋ′gəl), *adj.* = **fungus.**
**fungi** (fun′ji), *alternative plural of* **fungus.**
**fungoid** (fuŋ′goid), *adj.* قارچکی؛ تایبەت بە قارچك.
*n.* قارچك؛ کەڕوو؛ ڕووەکی وەك قارچك.
**fungous** (fuŋ′gəs), *adj.* (١) وەك قارچك یا کەڕوو؛ تایبەتی بە قارچك
یا کەڕوو. (٢) لەپڕ سەر هەڵدەدات و لەپڕ نامێنێ.
**fungus** (fuŋ′gəs), *n.* (١) قارچك؛ کەڕوو؛ ڕووەکی قارچکی.
(٢) شتێك کە لەپڕ دەڕوێت بەڵام زۆر بەردەوام نابێ.
**funk** (fuŋk), *n.* [Colloq.]. (١) ترسان؛ ترس؛ زراوچوون؛ وورە بەردان.
(٢) کەسێکی زراوچوو یا وورەبەردەر.
*v.i.* [Colloq.], ترسان و پاشگەزبوونەوە.
*v.t.* [Colloq.], (١) ترسان؛ لێ ترسان. (٢) خۆ لێ دزینەوە لە ترسدا.
**-funky** *(adj.).*
**funky** (fuŋ′ki), *adj.* سادە؛ حاکی *( a ~ hotel)* .
**funnel** (fun′'l), *n.* (١) ڕەحەتی (٢) دووکەڵکێش.
*v.i. & v.t.* بە ڕەحەتی تێکردن. ناردن، یا ئاراستەکردن لە یەك شوێنەوە.
**funniness** (fun′i-nis), *n.* ئەنتیکەیی؛ سەیرخۆشی؛ قۆشمەیی.
**funny** (fun′i), *adj.* (١) ئەنتیکە؛ سەیرخۆش؛ قۆشمە؛ قۆشمەچی؛
قۆشمەباز؛ نوکتەچی. (٢) [Colloq.]. سەیر؛ نائاسا.
*n.* وێنەی سەیرو قۆشمە لە ڕۆژنامەیەکدا؛ ئەو بەشەی ڕۆژنامەیەك کە ئەم جۆرە
وێنانەی تێدایە.
**-funnily** *(adv.).*
**fur** (fũr), *n.* (١) تووکی نەرم و شلی هەندێ گیاندار.
(٢) کەوڵی ئەم جۆرە گیاندارانە. (٣) فەروە؛ کەوڵ.
*adj.* فەروە؛ لە کەوڵ درووستکراو
*v.t.* (١) بە فەروە کردن یا داپۆشین یا ڕازاندنەوە. (٢) تەخت کردن.
**furbish** (fũr′bish), *v.t.* (١) ساف و لووس کردن؛ بۆیەکردن و بریقانەوە.
(٢) ~ up ، تازەکردنەوە؛ چاکردنەوە.
**furfur** (fũr′fẽr), *n.* کرێشی سەر
**furious** (fyoor′i-əs), *adj.* (١) زۆر تووڕە.
(٢) زۆر توندوتیژو بەهێز: *( a ~ attack)*
**furl** (fũrl), *v.t.* پێچانەوە (ئاڵا)؛ هەڵکردن؛ لوول کردن.
*v.i.* لوول بوون؛ هەڵکران.
*n.* (١) توێی شتێکی لوول کراو یا هەڵکراو.
(٢) لوول کردن؛ لوول بوون؛ پێچانەوە؛ هەڵکردن.

**furlong** (fũr′lôŋ), *n.* پێوانەیەکی دوورییە بریتییە لە هەشت یەکی
میلێك یا ٢٢٥ یارد.
**furlough** (fũr′lō), *n.* پشوو پێدان؛ پشوو (بەتایبەتی هی سەربان).
*v.t.* ڕێگەپێدان یا پشوودان بە سەربازێك بۆ ماوەیەك.
**furnace** (fũr′nis), *n.* (١) تەنوور؛ کوورە؛ تەنووری گەرماو؛ توون.
(٢) شوێنێکی زۆر گەرم. (٣) تاقیکردنەوەیەکی گران.
**furnish** (fũr′nish), *v.t.* (١) دانانی ژێرەخەرو سەرەخەر لە ناوماڵدا.
(٢) پێدانی ئەو شتەی پێویستە؛ پێدانی هەمووشتێکی پێویست؛ پێدان.
**furnishings** (fũr′nish-iŋz), *n.pl.* (١) شتومەکی ناوماڵ وەك
کورسی و مێزو بەڕەو شتی وەهای تر. (٢) جل و بەرگ.
**furniture** (fũr′ni-chẽr), *n.* (١) شتومەکی ناوماڵ وەك کورسی و
مێزو جێی نووستن و بەڕە... هتد. (٢) [Archaic]: ئەو شتانەی پێویستە بۆ
سوارێك و ئەسپەکەی (وەك قەڵغان، زین... هتد).
**furor** (fyoor′ôr), *n.* (١) تووڕەیی؛ زۆر تووڕەیی.
(٢) شێتگیربوون. (٣) جۆش؛ هەستی بەتین؛ شەیدایی؛ بەزم.
**furrier** (fũr′i-ẽr, fũr′yẽr), *n.* (١) فەروەفرۆش؛ کەوڵ فرۆش.
(٢) وەستای فەروە.
**furriery** (fũr′i-ẽr-i), *n.* (١) فەروە بەگشتی؛ کەوڵ.
(٢) درووستکردن و چاکردنەوەو فرۆشتنی فەروە.
**furrow** (fũr′ō), *n.* (١) دێراو؛ هێڵی جووت؛ هێڵی کاسن.
(٢) شتێك کە لە دێراو بچێ؛ چرچی ناوچەوان یا دەم و چاو.
*v.t.* (١) دێراو هەڵدان؛ شەستەدان.
(٢) هەڵدڕین و پێدا ڕۆیشتن (کەشتی بە دەریادا).
*v.i.* (١) دێراو هەڵدان؛ شەستەدان. (٢) چرچ و لۆچ تێکەوتن (ناوچەوان).
**furry** (fũr′i), *adj.* (١) لە فەروە درووستکراو؛ هی فەروە.
(٢) فەروە لەبەر. (٣) قەراغەکەی بە فەروە گیراوە. (٤) فەروەیی.
**further** (fũr′*th*ẽr), *adj.* (١) دوورتر. (٢) (ا) زیاتر؛ زۆرتر؛ هی تر.
(ب) تر؛ هی تر: *( till ~ notice)* .
*adv.* (١) دوورتر (شوێن، کات)؛ بۆ دوورتر.
(٢) زیاتر (ڕادە، پلە)؛ تا ڕادەیەکی زیاتر. (٣) لەوە بەولاوە؛ زۆرتر
*v.t.* پەرەپێدان؛ پاڵپشتی کردن؛ پێشخستن؛ یارمەتیدان:
*( to ~ the cause of peace)*
**furtherance** (fũr′*th*ẽr-əns), *n.* (١) پەرەپێدان؛ یارمەتیدان؛
پێشخستن؛ پاڵپشتی کردن. (٢) یارمەتی؛ پاڵپشتی.
**furthermore** (fũr′*th*ẽr-môr´, ), *adv.* جگە
لەوەیش؛ لەوەیش بەولاوە؛ زیاد لەوەیش؛ زیاد لەمە.
**furthermost** (fũr′*th*ẽr-mōst´), *adj.* دوورترین (شوێن، کات،
پلە، ڕادە)؛ ئەوپەڕ (ڕادە).
**furthest** (fũr′*th*ist), *adj.* دوورترین.
*adv.* (١) دوورترین (شوێن، کات). (٢) ئەوپەڕ (ڕادە، پلە).
**furtive** (fũr′tiv), *adj.* نهێنی؛ دزی؛ پەنهانی؛ بە نهێنی؛ بێ خشپە:
*( a ~ look)*
**-furtively** *(adv.)*; **furtiveness** *(n.).*
**furuncle** (fyoor′uŋ-k'l), *n.* سوورەڵێکی بچووك.
**fury** (fyoor′i), *n.* (١) زۆر تووڕەیی؛ شێتگیری.
(٢) توندوتیژی؛ زەبر؛ دڕندەیی.
(٣) کەسێکی توندوتیژی دابین نەکراو (بەتایبەتی ئافرەت).
like fury, [Colloq.], (١) بە توندوتیژی؛ بە دڕندانە. (٢) زۆر خێرا.
**fuse** (fūz), *v.t.* (١) تواندنەوە. (٢) تێکەڵاوکردن؛ کردن بە یەك؛ یەکخستن.
*v.i.* (١) توانەوە. (٢) بوون بە یەك؛ تێکەڵاوبوون؛ یەککەوتن.
**fuse** (fūz), *n.* (١) پلیتەی تەقەمەنی. (٢) فیووز (ئەلەکتریك).
**fusee** (fū-zē′), *n.* (١) شقارتەیەك کە با نایکوژێنێتەوە.
(٢) ڕووناکییەکی سووری ووریاکەرەوەیە (هێڵی شەمەندەفەر)
(٣) پلیتەی تەقەمەنی. (٤) خولخولۆکەی زەنبەلەکی کاتژمێری کۆن.
**fuselage** (fū′z'l-ij, fū′s'l-ij, fū′zə-läzh´), *n.* لەشی فڕۆکە جگە

له باڵو کلکەکەی (کە شوێنی دانیشتن و بارە).

**fusion** (fū'zhən), *n.* (١) تووانەوەو بوون بە یەك؛ تێکەڵاوبوون.
(٢) بوون بە یەك؛ یەکگرتن؛ یەککەوتن: ***(a ~ of political parties)***.
(٣) شتێکی یەکگرتوو؛ شتێکی تێکەڵاو.

**fusion bomb,** بۆمبای هایدرۆجینی.

**fusionism** (fū'zhən-iz'm), *n.* یەکگرتنی جۆرەها حیزب یا کۆمەڵە یا نەتەوە؛ تیۆری و ڕێبازی ئەم یەکگرتنە.

**-fusionist** *(n.)*.

**fuss** (fus), *n.* (١) لە ئەندازە بەدەر مەراق خواردن بە شتی هیچ و پووچەوە؛ نازونووز؛ شپرزەیی و جرپنی لەسەر هیچ. (٢) کەسێکی وەها.
*v.i.* (١) لە ئەندازە بەدەر مەراق خواردن و شپرزەیی بە شتی هیچ و پووچەوە؛ نازونووزکردن (٢) زۆر گوێ بە شتی بێ بایەخ دان.
(٣) زۆر بە دەوروقنگدا هاتن و مەرایی کردن و بە درۆ بەتەنگەوەهاتن:
***(to ~ over somebody)***
*v.t.* مەراق خواردن لە خۆڕایی.

**fussy** (fus'i), *adj.* (١) شپرزە؛ جرپن؛ بە جرت و فرت.
(٢) بە هیچ ڕازی نابێت؛ بۆڵەبۆڵ کەر؛ بە نازونووز؛ بەقێزوبێز.
(٣) زۆر سەرنج بە شتی ووردو بێ بایەخ دەر؛ لە ئەندازە بەدەر پاك و تەمیزو گوێ بە شتی ناگرنگ دەر (لە ناومالْ یا دەرەوە).

**-fussiness** *(n.)*.

**fusty** (fus'ti), *adj.* (١) کەڕوو هەڵهێناو؛ بۆگەن. (٢) کۆن؛ کۆنباو.

**futile** (fū't'l), *adj.* (١) بێ سوود؛ بێ کەڵك؛ بێ ئەنجام.
(٢) بێ بایەخ؛ هیچ و پووچ؛ بێ نرخ؛ ناگرنگ.

**futility** (fū-til'ə-ti), *n.* (١) بێ سوودی؛ بێ کەڵکی؛ بێ ئەنجامی.
(٢) بێ بایەخی؛ هیچ و پووچی. (٣) شتێکی بێ سوود

**future** (fū'chẽr), *adj.* (١) هی دواڕۆژ؛ داهاتوو.
(٢) هی داهاتوو (ڕێزمان– کاتی کردار).
*n.* (١) دواڕۆژ؛ پاشەڕۆژ؛ داهاتوو؛ لەمەولا؛ لەمەودوا.
(٢) (*pl.*): شتێك کە دەکڕرێت و دەفرۆشرێت کە گوایە لە دواڕۆژدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت (پارەبازی). (٣) کاتی کرداری دواڕۆژ (ڕێزمان).

**futureless** (fū'chẽr-lis), *adj.* بێ دواڕۆژ؛ بێ هیوای دواڕۆژ؛ بێ ئاوات.

**future life,** ئەوەودنیا.

**future perfect tense,** کاتی کرداری دواڕۆژی تەواو (ڕێزمان):
(وەك " **will have finished** " لەم ڕستەیەدا:
**(I will have finished the dictionary by then.)**.

**futurism** (fū'chẽr-iz'm), *n.* ئایندەگەری: بیروباوەڕێکی هونەرییە لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا پەیدابوو داوای وازلێهێنانی شێوازی کۆنی هونەرو داهێنانی شێوازی نوێی دەکرد.

**-futurist** *(n.)*.

**futurity** (fū-toor'ə-ti, fū-tyoor'ə-ti), *n.* (١) دواڕۆژ؛ پاشەڕۆژ.
(٢) ڕووداوێك یا بارێکی دواڕۆژ. (٣) ڕەگەزی دواڕۆژ.

**fuze** (fūz), *n.* = fuse.

**fuze** (fūz), *v.t. & v.i.* to fuse.

**fuzee** (fū-zē'), *n.* = fusee.

**fuzz** (fuz), *n.* گەنگەموو (قۆخ، مرۆڤ)؛ گەندەموو:
***(the ~ on a peach)***
*v.t. & v.i.* بە گەندەموو داپۆشین.

**fuzzy** (fuz'i), *adj.* (١) بە گەندەموو داپۆشراو.
(٢) لێڵ (بیروباوەڕ، باری شتێك)؛ ناڕوون؛ نادیار.

**-fuzzily** *(adv.)*; **fuzziness** *(n.)*.

# G g

**G, g** (jē), ***n.*** (١) تیپی حەوتەمی ئەلفوبێی ئینگلیزیە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: "گ" یا "ج".
(٣) (ا) حەوتەم. (ب) ئەم تیپە بە چاپ کراوی یا هەڵکەنراوی.
***adj.*** (١) تایبەتی بە تیپی " G ". (٢) حەوتەم لە پلە یا ڕیزدا.
**G** (jē), ***n.*** (١) نیشانەی ژمارە (٤٠٠) لە ڕۆمانیدا.
(٢) [Slang]، هەزار دۆلار. (٣) نمرەی " باش " (قوتابخانە).
**gab** (gab), ***v.i.*** [Colloq.], چەنەدان؛ هەلەوەڕی کردن؛ قسەی زۆرو بێ تام کردن
***n.*** چەنەبازی؛ چەنەدان؛ زۆروێژی
**gabardine** (gab′ẽr-dēn′, gab′ẽr-dēn′), ***n.*** گەبەردین. جۆرە قوماشێکی خوری یا لۆکەیە.
**gabber** (gab′ẽr), ***n.*** [Colloq.], چەنەباز؛ زۆروێژ
**gabble** (gab′′l), ***v.i.*** چەنەدان؛ چەنەبازی کردن؛ قسەی بێ تام کردن.
***v.t.*** چەنەدان؛ زۆروێژی کردن.
***n.*** زۆروێژی؛ چەنەبازی.
**-gabbler** ***(n.)***
**gabby** (gab′i), ***adj.*** [Colloq.], زۆروێژ؛ چەنەباز؛ هەلەوەڕ.
**gable** (gā′b'l), ***n.*** (١) دیوارێکی سێگۆشەیی کە هەردوو لای بە سەربانێکی لێژ گیرابێت. (٢) تاقێکی سێگۆشەیی سەر دەرگا یا پەنجەرەیەك.
**gaby** (gā′bi), ***n.*** [Colloq.], کەسێکی ساویلکەو بێ مێشك
**gad** (gad), ***v.i.*** گەڕانێکی بێ ئامانج؛ گەڕان بەدوای ڕابواردندا.
**gad** (gad), ***n.*** (١) نەقیزە. (٢) ئەسکەنە؛ پێکارێکی وەك ئەسکەنە؛ منخ.
***v.t.*** (١) نەقیزە تێوەژەندن؛ تێوەژەندن. (٢) کانزای خام شکاندن بە ئەسکەنە.
**gadabout** (gad′ə-bout′), ***n.*** [Colloq.], کەسێکە کە هەمیشە بەدوای ڕابواردندا دەگەڕێ؛ خانە بێزار.
**gadder** (gad′ẽr), ***n.*** = **gadabout.**
**gadfly** (gad′flī′), ***n.*** (١) خەرەنگێز
(٢) کەسێکی خەڵك پەستکەر؛ ملۆزم.
**gadget** (gaj′it), ***n.*** (١) ئامێرێکی بچووك؛ بەشێکی بچووکی ئامێرێك.
(٢) شتێکی بچووك بەتایبەتی هی بێ سوودو ناپێویست.
**Gael** (gāl), ***n.*** گێل: هاوڵاتیەکی ناوچە بەرزەکانی ئوسکوتلەندە یا ئیرلەندە کە پێشیان دەڵێن: " سێلت "
**Gaelic** (gāl′ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە ڕەگەزی " گێل "
(٢) تایبەتی بە زمانی " گێلیك "
***n.*** زمانی " گێلیك " کە لە ئوسکوتلەندەو ئیرلەندە قسەی پێ دەکرێ.

**gaff** (gaf), ***n.*** (١) قولاپێکی گەورەی ئەستوور بەسەری دار یا ڕوویەکەوە (بۆ دەرهێنانی ماسی گەورە لە ئاو دوای گرتنی).
(٢) چوقولێکی تیژی ئاسنە دەکرێتە قاچی کەڵەشێری شەڕەوە.
(٣) [British Slang]، تیاترۆیەکی هەرزانبەها.
(٤) تەوەرەی کەشتی بایەوان.
***v.t.*** (١) ماسی گیراو دەرهێنان لە ئاو بە قولاپێکی بەهێز.
(٢) [Slang]، هەڵخەڵەتاندن.
**gaffe** (gaf), ***n.*** هەڵەیەك لە هەڵسان و دانیشتنی ناو کۆمەڵدا (ووتە یا کردار)؛ ووتە یا کردارێکی نابەجێ کە لەبەرچاوی خەڵك بکرێت.
**gag** (gag), ***v.t.*** (١) خنکاندن؛ ڕشانەوە
(٢) دەم داخستن بە شتێك بۆ قسە نەکردن یا هاوار نەکردن.
(٣) قسە لێ قەدەغەکردن؛ ڕێگەنەدانی قسەکردن و بیروڕا دەربڕین.
(٤) ڕاوە دانان یا قەدەغەکردنی دووان لە پەرلەماندا.
(٥) داخستن (مەکینە)؛ کوژاندنەوە.
***v.i.*** (١) خنکان؛ ڕشانەوە. (٢) [Slang]، گاڵتەوگەپ کردن؛ نوکتەبازی کردن
***n.*** (١) شتێك کە دەخرێتە دەمەوە بۆ قسە نەکردن یا هاوار نەکردن؛ دەم داخەر. (٢) دووان لێ قەدەغەکردن (دادگا):
***( The judge issued a ~ order.)***
(٣) شتێك کە دانساز بەکاری دەهێنێت بۆ دەم کردنەوە. (٤) لغاو.
(٥) (ا) نوکتە؛ گاڵتە. (ب) فێڵ؛ فێڵ و تەڵەکە.
**gage** (gāj), ***n.*** (١) بارمتە. (٢) بەڵێن (بەتایبەتی هی هاتن بۆ شەڕ بە فڕێدانی دەستکێشێك لەبەرچاوی بەرامبەرەکەت بۆ نیشانەی ئەم بەڵێنە)
(٣) ڕووبەڕوو وەستان؛ مەیدانخوازی.
***v.t.*** [Archaic], (١) گرەوکردن. (٢) بەستنەوە بە بەڵێنێکەوە.
**gage** (gāj), ***n. & v.t.*** = **gauge.**
**gage** (gāj), ***n.*** قۆخ.
**gag man,** نوکتەباز؛ نوکتەچی؛ قۆشمەچی.
**gag rule ( or law ),** قەدەغەکردنی لێدووان لە مەسەلەیەك (بەتایبەتی لە دادگا یا پەرلەماندا).
**gaiety** (gā′ə-ti), ***n.*** (١) خۆشی؛ کەیف و خۆشی و زەماوەند.
(٢) نوواندن.
**gaily** (gā′li), ***adv.*** (١) بە خۆشی و بە کەیفەوە.
(٢) بە ڕەنگی جوان و گەشەوە.
**gain** (gān), ***n.*** (١) زیادە (بەتایبەتی لە سامان یا لە دەسکەوتدا).
(٢) دەسکەوت؛ دەسکەوتن؛ سوود؛ قازانج.
***v.t.*** (١) دەسکەوتن؛ پەیداکردن. (٢) بردنەوە (ملەملێ).
(٣) دەسکەوتن (قازانج، سوود). (٤) گەیشتن.
(٥) زیادبوون (سەنگ)؛ قەڵەوبوون: ***( to ~ weight)*** .
***v.i.*** (١) پێشکەوتن. (٢) زیادبوون (سەنگ)؛ قەڵەوبوون.
**gain on,** پێشکەوتن (ملەملێ).
**gain over,** ڕاکێشانە لای خۆ.
**gainful** (gān′fəl), ***adj.*** بەسوود؛ سوودبەخش؛ بەکەڵك:
***( ~ employment)***
**-gainfully** ***(adv.).***
**gainly** (gān′li), ***adj.*** جوان؛ بە لەنجەولار؛ قۆز.
**gainsay** (gān′sā′), ***v.t.*** (١) حاشاکردن.
(٢) بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.
**gait** (gāt), ***n.*** ڕەوت (ئەسپ، مرۆڤ)؛ لارولەنجە.
***v.t.*** ڕەوت کردن بە ئەسپ و ماین.
**gaiter** (gā′tẽr), ***n.*** (١) پووزەوانە. (٢) گێترە (سەرباز، پۆلیس).
(٣) پێڵاوی بێ قەیتان.
**gal** (gal), ***n.*** [Slang], = **girl.**
**gala** (gā′lə, gal′ə, gä′lə), ***n.*** ئاهەنگ؛ زەماوەند.
***adj.*** خۆش؛ زەماوەندی.
**in gala.** بە جلی زەماوەندەوە؛ بە جلی جوان و ڕازاوەو سەیرانەوە.

**galactic** (gə-lak′tik), *adj.* (١) شیر؛ شیری؛ لە شیر وەرگیراو.
(٢) هی هێلی کاکێشان (ئەستێرەناسی). (٣) ڕەوانی شیر زیادکەر.
**galavant** (gal′ə-vant′), *v.i.* = **gallivant.**
**galaxy** (gal′ək-si), *n.* (١) [(ڕ-)] هێلی کاکێشان (ئەستێرەناسی).
(٢) کۆنەستێرە؛ کۆمەڵە ئەستێرە.
(٣) (ا) دەستەیەك مرۆڤی زیرەك و بەناوبانگ. (ب) کۆمەڵێك شتی بریقەدار.
**gale** (gāl), *n.* (١) بای قایم. (٢) [Poetic]، شەمال
(٣) قاقای پێکەنین؛ هەڵچوونێك. (٤) [Colloq.]، جۆش وخرۆشی.
**gall** (gôl), *n.* (١) زراو؛ زەرداو (٢) شتێکی تاڵ و ناخۆش. (٣) ڕق؛ قین.
(٤) [Colloq.]. بێ حەیایی؛ چاوقایمی؛ بێ شەرمی.
**gall** (gôl), *n.* (١) جەدەو (ئەسپ، ماین)؛ برین. (٢) (ا) پەستی؛ زویری.
(ب) هۆی پەستی یا زویری. (٣) شوێنێکی سوواو یا بێ هێز.
*v.t.* (١) ڕووشاندن (پێست)؛ بریندارکردن بە لێخشاندن.
(٢) پەستکردن؛ زویرکردن.
*v.i.* ڕووشان؛ بریندابوون بە لێخشاندن
**gall** (gôl), *n.* لووی ڕووەك؛ دوومەڵێکە لە ڕووەك دێت بەهۆی جانەوەر یا بەکتریاوە.
**gallant** (gal′ənt), *adj.* (١) جوان؛ گەورەو جوان؛ قەشەنگ:
*(a ~ ship)*
(٢) ئازا؛ بەجەرگ؛ جوامێر؛ نەترساو؛ مەرد: *(a ~ warrior, man, etc.)*.
(٣) جوان و کەشخە (جل وبەرگ): *(~ attire)*
(٤) (ا) بە ڕەفتارو ناسك لە هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ ئافرەتدا؛ جوامێر.
(ب) دڵدار؛ حەزکەر لە دڵداری.
*n.* (١) کەسێکی ئازا؛ جوامێرێك.
(٢) (ا) کەسێکی ڕەفتار جوان لەگەڵ ئافرەتدا؛ جوامێر. (ب) دڵدار.
*v.t.* (١) دڵداری کردن لەگەڵ ئافرەتێکدا
(٢) لەگەڵ ئافرەتێکدا بوون بۆ پاراستن یا ئاگاداری.
*v.i.* ڕەفتاری جوامێرانە نوواندن.
**gallantry** (gal′ən-tri), *n.* (١) ئازایی؛ جوامێری؛ نەترسان.
(٢) ڕەووشتی دڵدارانە (٣) (*pl.*) کردەوەو ووتەی جوامێرانەو پیاوانە.
(٤) دڵداری (٥) [Archaic]، نوواندن؛ خۆدەرخستن.
**gall bladder,** زراو؛ زەرداو یا تاڵاو.
**gallery** (gal′ēr-i), *n.* (١) هەیوان؛ سەکۆ؛ ڕاڕەو. (٢) باڵکۆن.
(٣) سەکۆی دواوەی کەشتی بایەوانی کۆن.
(٤) باڵکۆنی نهۆمی دووەمی سینەما یا تیاترۆ (کە هەرزانترین جێگەیە).
(٥) هەرزانترین جێی سینەما یا تیاترۆ.
(٦) ئەو کەسانەی لەم جێگا هەرزانانە دادەنیشن. (٧) زەوقی بۆرەپیاو.
(٨) گوێگران یا تەماشاکەران (لە یاریگا یا کۆبوونەوەی پەرلەماندا).
(٩) ڕاڕەو یا ژوورێکی تەسك و درێژ. (١٠) نیگارگا؛ نیگارخانە؛ گەلەری.
(١١) کۆمەڵە نیگارو تابلۆو پەیکەر.
(١٢) شوێنی وێنەگرتن، نیشان شکاندن... هتد: *(a shooting ~)*.
(١٣) خەنەقی ژێرزەمین.
**play to the gallery,** (١) خۆنوواندن لەسەر شانۆ بە جۆرێك کە تەماشاکەرانی جێگە هەرزانەکان، واتە بۆرە پیاوان،پەسەندی بکەن.
(٢) ڕەفتارنوواندن بە جۆرێك کە بۆرەپیاوان پێیان خۆش بێت.
**galley** (gal′i), *n.* (١) کەشتییەکی درێژکۆلەی کۆنە بە بایەوان و سەوڵ لێ دەخورێت (٢) بەلەمێکی سەوڵە لەسەر کەشتی جەنگی ئینگلیزی.
(٣) چێشتخانە واتە مووبەقی کەشتی یا فڕۆکە.
(٤) سینییەکی تەنکە تیپی ئامادەی چاپەمەنی تێدا هەڵدەگیرێت.
**galley proof,** نموونەی یەکەمی چاپەمەنی (پێش هەڵەبڕکردنی و دوا چاپکردنی)
**galley slave,** (١) بەندی سەوڵ لێدەر لەسەر کەشتی بایەوان و سەوڵ.
(٢) زەحمەتکێش؛ کرێکاری کاری ووشك و ناخۆش.
**Gallic** (gal′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە وولاتی " گۆل " ی کۆن، واتە فەرەنسا و خەڵکەکەی (٢) فەرەنسی.

**galling** (gôl′iŋ), *adj.* پەستکەر؛ زویرکەر.
**gallivant** (gal′ə-vant′, gal′ə-vant′), *v.i.* گەڕان بەدوای ڕابواردندا.
**gallon** (gal′ən), *n.* گالۆن.
**gallop** (gal′əp), *n.* (١) غار؛ غارغارێن؛ ڕمبازێن؛ ڕمبازی.
(٢) [Colloq.]، کارێکی زۆر خێرا.
*v.i.* (١) غارغارێن کردن؛ ڕمبازی کردن؛ تاودان
(٢) زۆر بە خێرا کارکردن یا جوولانەوە.
*v.t.* غارپێکردن.
-galloper *(n.)*.
**gallows** (gal′ōz), *n.* (١) سێدارە؛ قەنارە.
(٢) هەڵواسین؛ کردن بە سێدارەدا.
(٣) کەسێك کە شایستەی هەڵواسین بێت بە سێدارەدا.
**gallows bird,** [Colloq.], کەسێك کە شایستەی هەڵواسین بێت بە سێدارەدا.
**gallows humor,** جۆرە نوکتەو قۆشمەبازییەکە کە شتی ناخۆش بە هیچ وپووچ و سووك و لاقرتێ دەگرێ و دەردەخات.
**gallstone** (gôl′stōn′), *n.* بەردی ناو زراو.
**galoot, galloot** (gə-lo͞ot′), *n.* [Slang], کەسێکی ناقۆڵاو لەش لاروخوارو پێنتی و بێ مێشك.
**galop** (gal′əp), *n.* (١) سەمایەکی خێرا. (٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**galore** (gə-lôr′), *adv.* فرە؛ زەبەنە؛ ئێجگار زۆر:
*(She has dresses ~.)*
*n.* [Rare], فرە؛ زۆر؛ زەبەنە
**galosh, galoshe** (gə-losh′), *n.* کالۆش: پێڵاوێکی لاستیکی ئاو نەدزە لەسەر پێڵاوی ترەوە لەپێ دەکرێت.
**galvanic** (gal-van′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە تەووژمی ئەلەکتریکی باتری. (٢) ووریاکەرەوە یا هێنەرەجۆش (وەك بە تەووژمی ئەلەکتریك)؛ بزوێنەر.
**galvanism** (gal′və-niz′m), *n.* (١) ئەلەکتریکی پێکهێنراو لە کارلێکردنی کیمیایی. (٢) ئەو لقەی زانستی فیزیا کە لەمە دەکۆڵێتەوە.
(٣) بەکارهێنانی ئەلەکتریك بۆ چارەکردنی نەخۆشی.
**galvanize** (gal′və-nīz′), *v.t.* (١) تەووژمی ئەلەکتریك لێدان (بۆ لەحیم کردن یا کاری وەها). (٢) هێنانەجۆش؛ جم وجووڵ تێخستن؛ بزواندن.
(٣) ڕووکەش کردن بە چینکۆ (بەتایبەتی ئاسن بۆ ژەنگ هەڵنەهێنان)؛ چینکۆکردن.
-galvanization *(n.)*.
**galvanized iron,** ئاسنی ڕووکەش کراو بە چینکۆ (بۆ ژەنگ-هەڵنەهێنان).
**galvanometer** (gal′və-nom′ə-tēr), *n.* پێوەری تەووژمی ئەلەکتریك.
**galvanoscope** (gal-van′ə-skōp′), *n.* دۆزەرەوەی تەووژمی بێ هێزی ئەلەکتریك.
**gam** (gam), *n.* (١) دیدەنی (لەنێوان ڕاوکەری نەهەنگدا).
(٢) تاقمێك نەهەنگ.
*v.i.* (١) دیدەنی کردن (بەتایبەتی لە دەریادا). (٢) یەککگرتنەوەی تاقمە نەهەنگ.
*v.t.* دیدەنی کردن (لە دەریادا).
**gambit** (gam′bit), *n.* (١) سەرباز کردن بە قوربانی بۆ دەسکەوتێکی گەورەتر (یاری شەترەنج). (٢) مناوەرە (بۆ دەسکەوتێکی گەورە).
**gamble** (gam′b'l), *v.i.* (١) قومارکردن. (٢) شتێکی پڕ مەترسی کردن لە پێناوی دەسکەوتێکی گەورەدا.
*v.t.* (١) (**~ away**)، پارە دۆڕاندن بە قومار. (٢) گرەوکردن.
*n.* کردارێکی پڕ مەترسی؛ قومار؛ هات ونەهات؛ دووبەختی.
**gambler** (gam′blēr), *n.* قومارچی؛ قومارکەر.
**gambol** (gam′bəl), *n.* قەڵەمبازدان و یاری کردن؛ یاری.

*v.i.* قەڵەمبارددان‌و یاری کردن؛ یاری کردن.
**game** (gām), *n.* (١) یاری؛ گەمە
*( Football and basketball are ~s.)*
(٢) شێوەی یاری کردن
(٣) تاقیکردنەوەی ئازایی، زیرەکی، یا دەربردن. *( the ~ of life)* .
(٤) پیلان *( He saw through her ~.)*
(٥) گیاندارو باڵندەی کێوی ڕاوکراو
(٦) گۆشتی گیاندارو باڵندەی کێوی ڕاوکراو. (٧) [Colloq.]، ئامانج.
(٨) [Slang]، کاروبار، یا کاسبی‌یەکی پڕ مەترسی.
*v.i.* قومارکردن
*v.t.* پارە دۆڕاندن بە قومار.
*adj.* (١) تایبەتی بە گیاندارو باڵندەی کێوی ڕاوکراو.
(٢) (ا) ئازا (ب) ئامادەو بەجۆش: *( He's ~ for anything.)* .
**big game,** (١) گیانداری کێوی گەورەی ڕاوکراو (شێر، پڵنگ... هتد).
(٢) [Slang]، کارێکی گرنگ‌و پڕ مەترسی.
**make game of,** گاڵتەپێکردن؛ بە گاڵتەگرتن یا دانەبەر.
**play the game,** [Colloq.]. (١) پەیڕەوی کردنی دەستووری کاروبارێک.
(٢) بە ڕەوا ڕەفتارکردن.
**the game is up,** پیلانەکە ژێرکەوتووە یا تێکشکاوە.
**gamecock** (gām′kok′), *n.* کەڵەشێری شەڕ
**gamekeeper** (gām′kēp′ẽr), *n.* پاسەوانی باڵندەو گیانداری کێوی.
**game laws,** یاسای ڕاوکردنی گیاندارو باڵندەی کێوی.
**gamely** (gām′li), *adv.* ئازایانە
**gamesome** (gām′səm), *n.* بەکەیف؛ حەز لە یاری کەر.
**gamester** (gām′stẽr), *n.* قومارچی؛ قومارکەر
**gamete** (gam′ēt, gə-mēt′), *n.* گەمیت: خانەی زاوزێ: خانەیەکە لەگەڵ خانەیەکی تردا جووت دەگرن‌و دەبنە زیندەوەری تازە.
**gamic** (gam′ik), *adj.* زاووزێیی
**gamma** (gam′ə), *n.* (١) تیپی سێیەمی ئەلف‌وبێی یۆنانی.
(٢) سێیەم. (٣) مایکرۆگرام.
**gamma rays,** تیشکی گاما.
**gammer** (gam′ẽr), *n.* پیرێژن (بەتایبەتی لادێیی).
**gammon** (gam′ən), *n.* مەرز (تاونە
**gammon** (gam′ən), *n. & interj.* [Colloq.]. قسەی قۆڕو بێ مانا (بۆ هەڵخەڵەتاندن.
*v.t. & v.i.* [Colloq.], قسەی قۆڕو بێ مانا کردن
**-gamous** (gə-məs), پاشگرێکە بەمانای: ژنهێنان‌و شووکردن:
*( monogamous, polygamous)*
**gamut** (gam′ət), *n.* (١) هەموو مەودای ئاوازی مۆسیقا.
(٢) هەموو مەودا یا ڕادە؛ لە سەرەتاوە تا دوایی؛ هەموو:
*( She ran the ~ of emotions.)*
**gamy** (gām′i), *adj.* (١) تامێکی تیژی هەیە (وەك گۆشتی باڵندەو گیانداری کێوی) (٢) بۆندار؛ نەختێك بۆگەن. (٣) بزێو.
**-gamy** (gə-mi), پاشگرێکە بەمانای ژنهێنان‌و شووکردن:
*( polygamy)*
**gander** (gan′dẽr), *n.* (١) نێرەی قاز. (٢) کەسێکی گەوج‌و بێ مێشك.
(٣) [Slang]، سەیرکردنێك.
**gang** (gaŋ), *n.* (١) دەستە کرێکار
(٢) دەستە شەلاتی؛ دەستەیەك پیاوکوژ یا پیاوخراپ.
(٣) تاقمێك بەند کە پێکەوە ئیشیان پێ دەکرێ.
(٤) دەستەیەك هەرزەی گەڕەك؛ پێڕ؛ تاقم.
(٥) دەستە (ئامێر)
*v.i.* ( ~ **up** ), بوون بە دەستە؛ بوون بە تاقم
*v.t.* [Colloq.], کەلەکۆمەکی لێکردن؛ بە تاقم پەلاماردان.
**gang up on,** [Slang], کەلەکۆمەکی لێکردن.

**gangrene** (gaŋ′grēn), *n.* گانگرین؛ تیراوێ: بڕینێکی زۆر پیسە لە قاچ‌و دەست‌و لاق‌و باڵ دێت‌و دایدەڕزێنێت‌و ساڕێژبوونەوەی زەحمەتە.
*v.i. & v.t.* تووشی تیراوێ بوون؛ پووکانەوە؛ داڕزانی ئەندامی لەش.
-gangrenous *(adj.)*.
**gangster** (gaŋ′stẽr), *n.* ئەندامی تاقمێك شەلاتی؛ شەلاتی؛ شەقاوە؛ پیاوخراپ.
**gangway** (gaŋ′wā′), *n.* (١) ڕاڕەو؛ دەرگا.
(٢) دەرگای تەنیشتی کەشتی. (٣) ڕاڕەوێکی سەردەمی تەختە.
(٤) ڕاڕەوی نێوان ڕیزە کورسی.
(٥) ڕاڕەوی دووبەشکەری پەرلەمانی ئینگلتەرە.
(٦) چین یا ڕاڕەوی سەرەکی کانی ژێرزەمین.
**gantlet** (gônt′lit, gant′lit), *n.* (١) سزایەکی سوپایی‌یە سەربازی گوناهبار ڕای دەکرد بەناو دوو ڕیز سەربازداو لە هەردوو ڕیزەکەوە بە دار لێیان دەدا. (٢) چەند دەردەسەری‌یەك؛ چەند ناخۆشی‌یەکی یەك لە دوای یەك
(٣) دوو هێڵی شەمەندەفەر کە لە جێگەیەکی تەسکدا دەبن بەیەك.
*v.t.* کردن بەیەکی دوو هێڵی شەمەندەفەر.
**run the gantlet,** (١) سزا خواردن (ژمارە یەك ببینە).
(٢) بەردەوام بوون لەسەر کاری خۆ لەکاتێکدا کە لە هەموولایەکەوە هێرشت دەکرێتە سەر.
**gantlet** (gônt′lit, gant′lit), *n.* = **gauntlet.**
**gantry** (gan′tri), *n.* (١) چوارچێوەی بەرمیل لەسەر دانان لەسەر لا.
(٢) چوارچێوەی هەڵگرتن‌و گواستنەوەی مەکینەی بەرزکەرەوەی خانوو کردن
(٣) چوارچێوەی نیشارەتی هێڵی شەمەندەفەر.
**gaol** (jāl), *n.* = **jail.**
**gaoler** (jāl′ẽr), *n.* = **jailer.**
**gap** (gap), *n.* (١) بۆشایی؛ کەلەبەر؛ کون؛ درز؛ کەلێن؛ دەلاقە.
(٢) دەربەنگ؛ کەل؛ کەلایی؛ چەم.
(٣) پچڕپچڕی.
(٤) جیاوازی: *( There's a ~ between his thinking and mine.)* .
*v.t.* کەلەبەرتێکردن؛ کون تێکردن
**gape** (gāp), *v.i.* (١) دەم داچەقاندن (باوێشك. برسێتی).
(٢) چاو تێ بڕین بە دەم داچەقاوی (لە سەرسامیدا)؛ ئەبلەق بوون
(٣) کردنەوە؛ داپچڕاندن.
*n.* (١) (ا) ئەبلەق بوون؛ چاو تێ بڕینێك بە دەم داچەقاوی (لە سەرسامیدا).
(ب) باوێشك. (٢) کون؛ درزێکی گەورە؛ کەلەبەر.
(٣) دەم داچەقان.
**garage** (gə-räzh′, gə-räj′), *n.* گەراج.
*v.t.* خستنە گەراجەوە.
**garb** (gärb), *n.* (١) جل‌وبەرگ؛ جل. (٢) ڕووکەش؛ دیوی دەرەوە.
(٣) [Obs.]، شێواز.
*v.t.* جل کردنەبەر؛ پۆشین؛ پۆشتەکردن.
**garbage** (gär′bij), *n.* (١) پاشەڕۆك؛ پیسایی؛ زبڵ؛ گەندوگو.
(٢) شتی بێ فەڕو هیچ‌وپووچ: *( literary ~ )*
**garbage bin,** زبڵدانی گەورە.
**garbage can,** زبڵدان؛ تەنەکەی خۆڵ‌و بەرماوەو زبڵ.
**garbage collecter,** خۆڵڕێژ؛ زبڵڕێژ؛ زبڵ کێش.
**garble** (gär′b'l), *v.t.* (١) [Rare] ، لە بێژنگ دان؛ پاك‌وپیس کردن.
(٢) شێواندن (چیرۆك)؛ تێکدان؛ بەسەریەکدادان.
**garden** (gär′d'n), *n.* (١) باخچە؛ باخ؛ بێستان؛ باخی سەوزە.
(٢) (*pl.*) باخچەی گشتی؛ گوڵستان.
*v.i.* باخەوانی کردن؛ باخچە ناشتن‌و پەروەردەکردن.
*v.t.* باخچە ناشتن‌و پەروەردەکردن.
*adj.* (١) باخچەیی؛ هی باخچە. (٢) (ا) ئاسایی؛ سادە. (ب) بە کێش.
**garden cress,** تەرەتیزە. (هەروەها " cress ").
**gardener** (gärd′nẽr, gär′d'n-ẽr), *n.* باخەوان.

**gardenia** (gär-dēn′yə, gär-dē′ni-ə), ***n.*** گاردۆنیا (گوڵ، ڕووەك)
**gargle** (gär′g'l), ***v.t. & v.i.*** غەرغەرەكردن.
***n.*** ئاو یا شلەی غەرغەرەپێكردن.
**gargoyle** (gär′goil), ***n.*** پەیكەر یا پلووسكە ئاوێكە لە شێوەی دەعبایەك یا گیاندارێكی سەیردا بە گوێ سەبانەوە یا لای سەرووی دیوارەوە.
**garish** (gâr′ish), ***adj.*** زەق (ڕەنگ)؛ زۆر بریقەدار.
**garland** (gär′lənd), ***n.*** (١) چەپكە گوڵو گەڵا (دەكرێتە سەر بۆ جوانی)؛ گوڵبەند (٢) كۆمەڵە هەڵبەست یا گۆرانی هەڵبژاردە.
***v.t.*** چەپكە گوڵو گەڵا ڕێكخستن؛ ڕازاندنەوە بە چەپكە گوڵو گەڵا.
**garlic** (gär′lik), ***n.*** سیر.
**-garlicky** *(adj.).*
**garment** (gär′mənt), ***n.*** جلوبەرگ؛ جل
***v.t.*** پۆشین؛ جل لەبەركردن.
**garner** (gär′nēr), ***n.*** (١) عەمباری گەنمو جۆو دانەوێڵە. (٢) گەنجینە.
***v.t.*** كۆكردنەوەو هەڵگرتن؛ كردنە عەمبارەوە.
**garnet** (gär′nit), ***n.*** (١) جۆرە بەردێكی بەنرخە. (٢) سوورێكی تۆخ.
**garnet** (gär′nit), ***n.*** ئامێری بەرزكەرەوە (بۆ باركردنی كەشتیو بارداگرتن).
**garnish** (gär′nish), ***v.t.*** (١) ڕازاندنەوە؛ جوانكردن.
(٢) ڕازاندنەوەی خواردەمەنی (یا هەر بۆ جوانی یا بۆ تام):
***(A steak is often ~ed with parsley.)***
(٣) دەست بەسەرداگرتنی بەشێك لە مووچە یا سەرمایەی قەرزارێك لەلایەن میرییەوە بۆ قەرزدانەوە.
***n.*** (١) جوانی؛ شتێكی جوان. (٢) شتێك كە دەخرێتە سەر قاپ لەگەڵ خواردەمەنیدا بۆ جوانی یا تام (وەك كەرەوز، بادەم... هتد).
(٣) [Obs.]؛ مز (بەتایبەتی كە لە بەندی تازە دەسەنرا لەلایەن بەندە كۆنەكان یا پاسەوانی بەندیخانەوە).
**-garnishment** *(n.).*
**garnishee** (gär′ni-shē′), ***n.*** كەسێك كە دەست بەسەر بەشێك لە مووچەكەیدا دەگیرێ بۆ قەرزدانەوە.
***v.t.*** دەست بەسەرداگرتنی بەشێك لە مووچە یا سەرمایەی قەرزارێك بۆ دانەوەی قەرزەكەی
**garniture** (gär′ni-chēr), ***n.*** شتی ڕازاندنەوە
**garret** (gar′it), ***n.*** ژووری بەینی سەربانو بنمیچ (لە خانوویەكدا كە سەربانی لێژی هەیە).
**garrison** (gar′i-s'n), ***n.*** (١) ئۆردوو (٢) ئۆردوگا؛ قشڵە؛ قەڵا.
***v.t.*** ئۆردوو دانان لە قشڵە یا قەڵایەكدا بۆ پاراستنی.
**garrulity** (gə-rōō′lə-ti), ***n.*** زۆروێژی؛ چەنەبازی.
**garrulous** (gar′oo-ləs, gar′yoo-ləs), ***adj.*** زۆروێژ؛ چەنەباز؛ زۆربلێ؛ دەمەوەر
**garter** (gär′tēr), ***n.*** (١) ئاسقی گۆرەوی ژنانە.
(٢) [G-]. مەدالیایەكی بەرزی ئینگلیزییە.
***v.t.*** بەستن یا هەڵواسین بە ئاسقی
**garter belt,** قایشێكی لاستیكە ئاسقی پێوەیە ژنان دەیكەنە ناوقەدیان.
**garter snake,** جۆرە مارێكی بچووكی خەت خەتی ئەمەریكای باكوورە.
**gas** (gas), ***n.*** (١) گاز؛ هەوا؛ با؛ گازی كیمیایی (٢) باوبژە؛ بای ناوسك.
(٣) بەنزینی ئوتومبیل، فڕۆكە... هتد. (٤) [Slang]، لاف؛ هەلات؛ فیشاڵ.
***v.t.*** (١) بەنزین تێكردن (مەكینە).
(٢) هێرش بردنە سەر بە گاز؛ كوشتن یا برینداركردن بە گاز.
***v.i.*** (١) گاز لێ دەرچوون. (٢) [Slang]، فیشاڵ كردن؛ لاف لێدان.
***adj.*** تایبەتی بە گاز
**gas up,** پڕكردن لە بەنزین (ئوتومبیل)؛ بەنزین تێكردن.
**step on the gas, [Slang],** (١) پێ نان بە بەنزیندا؛ بەنزینی زیادە دان بە ئوتومبیل. (٢) پەلەكردن؛ خێراكردن.
**gasbag** (gas′bag′), ***n.*** (١) كیسەی گاز (باڵۆن)
(٢) [Slang]، كەسێكی زۆروێژ.
**gas burner,** زۆپا یا فڕنی گاز.
**gas chamber,** ژووری كوشتن بە گاز.
**gas engine,** مەكینەی بەنزین.
**gaseous** (gas′i-əs, gas′yəs), ***adj.*** گازین؛ تایبەتی بە گاز.
**gas fitter,** فیتەری بۆری گاز یا سووتەمەنی.
**gas furnace,** (١) كوورەی گاز دەرهێنەر لە خەڵووز. (٢) كوورەی گاز.
**gash** (gash), ***v.t.*** هەڵدڕین؛ بڕین؛ برینداركردن.
***n.*** قڵیشێكی قووڵ لە لەشدا؛ بڕین یا برینێكی قووڵ.
**gasify** (gas′ə-fī′), ***v.t. & v.i.*** كردن بە گاز.
**-gasification** *(n.).*
**gasket** (gas′kit), ***n.*** (١) قەپاغ؛ دەمەوانە.
(٢) گوریسی پێچانەوەی بایەوانی قەدكراو بە تەوەرەوە.
**gas mask,** ماسكەی گاز: بۆ هەڵنەمژینی گازی ژەهراوی.
**gas meter,** پێوەری گاز: بۆ پێوانی سووتەمەنی بەكارهێنراو لە ماڵاندا.
**gasoline, gasolene** (gas′'l-ēn′, gas′'l-ēn′), ***n.*** بەنزین؛ گازۆلین.
**gasometer** (gas-om′ə-tēr), ***n.*** (١) دەفری تیا هەڵگرتنو پێوانی گاز. (٢) عەمباری گاز.
**gasp** (gasp), ***v.i. & v.t.*** هەناسەبڕكێ؛ هەنسكدان؛ هەنسك.
**at the last gasp,** (١) لە دوا هەناسەدا؛ كاتی دەم بەیەكدادان؛ لەپێش مردندا. (٢) زۆر درەنگ؛ لە هەرە دواییدا.
**gas station,** بەنزینخانە.
**gassy** (gas′i), ***adj.*** (١) پڕ لە گاز. (٢) وەك گاز؛ گاز ئاسا
(٣) [Colloq.]، فیشاڵچی؛ فیشاڵباز.
**gastrectomy** (gas-trek′tə-mi), ***n.*** لابردنی بەشێك لە سك (پزیشكەوانی).
**gastric** (gas′trik), ***adj.*** تایبەتی بە سك؛ هی سك.
**gastric ulcer,** برینی دیواری ناوەوەی سك.
**gastritis** (gas-trī′tis), ***n.*** هەوكردن، سووربوونەوە یا برینداربوونی دیواری ناوەوەی سك.
**gastro-** (gas′trō, gas′trə), پێشگرێكە بەمانای: سك؛ هی سك.
**gastrointestinal** (gas′trō-in-tes′ti-n'l), ***adj.*** هی سكو ڕیخۆڵە.
**gastronome** (gas′trə-nōm′), ***n.*** كەسێكە كە حەز لە خواردنی باش دەكات.
**-gastronomer** *(n.)*; **gastronomic** *(adj.)*; **gastronomist** *(n.).*
**gastronomy** (gas-tron′ə-mi), ***n.*** هونەری خواردنی باش خواردن.
**gastroscope** (gas′trə-skōp′), ***n.*** ئامێری لێ وردبوونەوەی ناوسك.
**-gastroscopic** *(adj.)*; **gastroscopy** *(n.).*
**gate** (gāt), ***n.*** (١) چەپەرە؛ دەرگای دەرەوە؛ دەروازە؛ چەپەر.
(٢) دەرگا؛ ڕێگە: ***(the ~ of one's heart)***.
(٣) دەربەند؛ كەل. (٤) دەرگا یا كونی دابینكردنی ئاو لە بەستێكدا.
(٥) (ا) سەرجەمی پارەی بلیتی نواندنێكی گشتی یا پیشانگایەك
(ب) سەرجەمی گوێگران یا تەماشاكەرانی نواندنێكی وەها.
***v.t.*** [British]. قەدەغەكردنی چوونە دەرەوەی قوتابییەكی كۆلیج لە كۆلیجەكە.
**give the gate, [Slang],** دەركردن؛ لە كۆڵ خۆ كردنەوە؛ خۆ لێ ڕزگاركردن.
**gateway** (gāt′wā′), ***n.*** (١) دەروازە؛ دەرگا.
(٢) ڕێگە؛ هۆی گەیشتن بە شوێنێكو لێ هاتنەوە دەرەوەی.
**gather** (gath′ēr), ***v.t.*** (١) كۆكردنەوە؛ گردكردنەوە؛ خڕكردنەوە.
(٢) چنینەوە؛ كردنەوەو كۆكردنەوە (گوڵ، میوە):
***(to ~ a harvest, flowers, etc.)***
(٣) وا بۆ دەركەوتن؛ وا تێگەیشتن: ***(I ~ that you disagree.)***
(٤) خۆ گورج كردنەوەو ئامادەكردن.

(٥) زیادکردن: *( The car ~ed speed.)* .

(٦) جل هێنانەوەیەك یا قەدکردن. (٧) ناوچەوانی خۆ گرژکردن.

*v.i.* (١) کۆبوونەوە؛ کۆمەڵ بوون؛ گردبوونەوە. (٢) گەیین (دوومەڵ).

(٣) زیادبوون؛ زۆربوون. (٤) گرژبوون (ناوچەوان).

**gathering** (ga*th*′ẽr-iŋ), ***n.*** (١) کۆکردنەوە؛ گردکردنەوە.

(٢) کۆبوونەوە؛ کۆڕ؛ کۆمەڵ. (٣) دوومەڵ.

**gauche** (gōsh), ***adj.*** ناشرین (کردەوەی کۆمەڵایەتی)؛

کردەوەی نابەجێ.

**gaud** (gôd), ***n.*** شتێکی ڕازێنەرەوەی هەرزانبەها.

**gaudy** (gôd′i), ***adj.*** زەق (ڕەنگ)؛ زۆر بریقەدارو هەرزانبەها؛

لە ئەندازە بەدەر بریقەدار.

-**gaudily** ***(adv.)***; **gaudiness** ***(n.)***.

**gauffer** (gôf′ẽr), ***v.t.* & *n.*** = **goffer.**

**gauge** (gāj), ***n.*** (١) پێوانە؛ پێوەر؛ ئەندازە.

(٢) ڕادەی تیادا جێگەبوونەوە. (٣) پانایی نێوان دوو هێڵی شەمەندەفەر.

(٤) پانایی نێوان دوو پێچکەی هەردوولای ئوتومبیل.

(٥) تیرەکی لوولەی تفەنگ.

(٦) (ا) شوێنی کەشتییەك سەبارەت بە کەشتییەکی ترو باوە.

(ب) ئەوەندەی کەشتییەك بە بارەوە نوقم دەبێت لە ئاودا.

*v.t.* (١) پێوان؛ ئەندازەگرتن. (٢) خەملاندن؛ بە گۆترە دانان؛ گۆترەکردن.

(٣) یەککردنی ئەندازەیەك لەگەڵ ئەندازەی گشتی.

(٤) گرتنەوەی قوڕوقسڵ بە ئەندازەی ڕاست.

**gauger** (gāj′ẽr), ***n.*** (١) پێوەر (مرۆڤ، ئامێر).

(٢) پێوەری بەرمیلی خواردنەوەی سەرخۆشکەر (بۆ باج لێگرتنی).

(٣) باجگر.

**gaunt** (gônt, gänt), ***adj.*** (١) لەڕولاواز؛ ڕەقەڵە؛ پووکاوە؛

لە برسدا ڕەرد هەڵگەڕاو. (٢) چۆڵوهۆڵو ناخۆش؛ دڵ پەستکەر.

**gauntlet** (gônt′lit, gänt′lit), ***n.*** (١) دەستکێشی شەڕ (کە ناوەوەی

لاستیکەو دەرەوەی ئاسنە بۆ پاراستن. ئەمەیش جۆرێکە لە قەڵغان).

(٢) دەستکێشی کار.

(٣) ڕووبەڕوو وەستان؛ ئەمە ئەرزو ئەمە گەز: *( to fling down the ~ )* .

**gauntlet** (gônt′lit, gänt′lit), ***n.*** (١) سزای سەربازێکە بریتییە لە

ڕاکردنی سەربازەکە بەناو دوو ڕیز سەربازدا، لەکاتێکدا کە لە هەردوو ڕیزەکەوە

بە دار لێی دەدەن. (٢) تاقیکردنەوەیەکی سەخت؛ کارێکی سەخت.

**gauze** (gôz), ***n.*** (١) کرێشە؛ برنجۆك؛ شاش.

(٢) تەمێکی تەنك؛ تەمومژێکی تەنك.

-**gauziness** ***(n.)***; **gauzy** ***(adj.)***.

**gave** (gāv), *past tense of* **give.**

**gavel** (gav′′l), ***n.*** (١) چەکوشی بەرد نەقاڕی کردن؛ چەکوش.

(٢) چەکوشی سەرۆکی کۆبوونەوە یا کۆڕێك.

**gawk** (gôk), ***n.*** کەسێکی ساویلکەی گەمژەی بێ مێشك.

***v.i.*** [Colloq.], چاو تێ برین و واق وڕمان؛ ئەبلەق بوون؛ واق وڕمان.

-**gawkily** ***(adv.)***; **gawkiness** ***(n.)***.

**gawky** (gôk′i), ***adj.*** شان و شەپیلك خوار.

***n.*** کەسێکی گەمژەو بێ مێشك.

**gay** (gā), ***adj.*** (١) بەکەیف؛ دڵخۆش.

(٢) کراوە (ڕەنگ)؛ جوان و ڕەنگاوڕەنگ: *( ~ colors)* .

(٣) حەز لە ڕابواردن کەر؛ سەرسەری: *( a ~ life)* .

(٤) [Colloq.]، هەتیوباز؛ حیز.

**gayety** (gā′ə-ti), ***n.*** = **gaiety.**

**gayly** (gā′li), ***adv.*** = **gaily.**

**gaze** (gāz), ***v.i.*** چاو تێ برین؛ سەیرکردن بەبێ چاو تروکاندن.

***n.*** چاو تێ برین؛ سەیرکردن بەبێ چاو تروکاندن.

**gazebo** (gə-zē′bō), ***n.*** سابات؛ کەپر.

**gazelle** (gə-zel′), ***n.*** ئاسك؛ ئاسکە کێوی.

**gazette** (gə-zet′), ***n.*** (١) ڕۆژنامە؛ غەزەتە.

(٢) بڵاونامەی فەرمانڕەوایی یا زانکۆ.

*v.t.* بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامە یا بڵاونامەدا.

**gazetteer** (gaz′ə-têr′), ***n.*** (١) ڕۆژنامەچی؛ ڕۆژنامەگەر.

(٢) کارگێڕی بڵاونامەیەکی فەرمانڕەوایی یا زانکۆ.

**gear** (gêr), ***n.*** (١) (ا) جل وبەرگ. (ب) جل وبەرگی سەرباز یا سوارچاکێك.

(٢) کەرەسەو پێداویستییەکانی کارێك. (٣) گێڕ (مەکینە).

*v.t.* (١) کەرەسەو پێداویستی تەواو پێدان.

(٢) گونجاندن؛ شیان:

*( They ~ed production to the new demand.)*

(٣) (ا) بە گێڕ لەیەکدان. (ب) خستنە گێڕەوە.

**gear up for,** خۆ بۆ ئامادەکردن: *( to gear up for a fight)* .

**high gear,** (١) گێڕی بەرز (٢) [Colloq.] ، خێرا؛ ئەوپەڕی توانا.

**in gear,** (١) لە گێڕدایە (٢) ڕێك وپێکە.

**low gear,** (١) گێڕی نزم، واتە هێواش و بەهێز.

(٢) [Colloq.]، هێواش

**not in gear,** (١) لە گێڕدا نییە؛ لە بۆشدایە.

(٢) شێواو؛ ناڕێك وپێك؛ تێکچوو.

**reverse gear,** گێڕی دواوە.

**shift gears,** (١) گێڕ گۆڕین. (٢) گۆڕینی شێوەی کردنی کارێك.

**gee** (jē), ***interj.* & *n.*** [Slang], ووشەیەکە سەرسامی دەردەبڕێت.

**gees** (gēs), *plural of* **goose.**

**geezer** (gē′zẽr), ***n.*** پیرە پیاوێکی سەیر.

**gel** (jel), ***n.*** جێل: ماددەیەکی جەلاتینییە.

**gelatin, gelatine** (jel′ə-t′n), ***n.*** جەلاتین.

**gelatinize** (ji-lat′′n-īz′), ***v.t.*** کردن بە جەلاتین.

*v.i.* بوون بە جەلاتین.

**gelatinous** (ji-lat′′n-əs), ***adj.*** جەلاتینی.

**gelation** (jel-ā′shən, jə-lā′shən), ***n.*** توندکردنەوە یا ڕەق کردنەوە

بە ساردی.

**geld** (geld), ***v.t.*** (١) خەساندن. (٢) لاوازکردن؛ بێ هێز کردن.

**geld** (geld), ***n.*** باجێکی کۆنی ئینگلیزییە.

**gelding** (gel′diŋ), ***n.*** یەختە؛ ئەسپی یەختە؛ ئەسپی خەسێنراو؛

ئەسپی خەساو.

**gelid** (jel′id), ***adj.*** سەهۆڵاوی؛ بەستوو؛ زۆر سارد.

**gelt** (gelt), *alternative past tense and p.p. of* **geld.**

**gem** (jem), ***n.*** (١) گەوهەر. (٢) شتێکی زۆر جوان و بەنرخ.

*v.t.* بە گەوهەر ڕازاندنەوەو جوانکردن.

**geminate** (jem′ə-nāt′), ***adj.*** جووت؛ دوانە.

*v.t.* کردن بە دوانە؛ جووت جووت کردن.

*v.i.* بوون بە دوانە؛ جووت جووت بوون.

-**gemination** ***(n.)***.

**Gemini** (jem′ə-nī′), ***n.*** (١) کۆنەستێرەی دوانە؛ ناوی جووت

ئەستێرەیەکە. (٢) بورجی جووتە ئەستێرە؛ کەلووی جووتەرانە.

**gemology, gemmology** (jem′ə-lə-ji), ***n.*** گەوهەرناسی.

-**gemologist** ***(n.)***.

**gemsbok** (gemz′bok′), ***n.*** کەڵەکێوییەکی ئەفەریقایی شاخ درێژە.

**gemstone** (jem′stōn′), ***n.*** گەوهەر؛ بەردی بەنرخ.

**gendarme** (zhän′därm), ***n.*** جەندرمە؛ پۆلیس.

**gendarmerie** (zhän′där-mẽr-i), ***n.*** هێزی جەندرمە یا پۆلیس.

**gendarmery** (zhän′där-mẽr-i), ***n.*** = **gendarmerie.**

**gender** (jen′dẽr), ***n.*** (١) نێرو مێ لە ڕێزماندا؛ توخم (ڕێزمان).

(٢) [Colloq.]، نێرینەو مێینە؛ نێرومێ.

**gene** (jēn), ***n.*** جین: شانەی هەڵگری تایبەخۆکانی توخم یا ڕەگەز لە نەوەی

کۆنەوە بۆ نەوەی تازە.

**genealogical** (jē´ni-ə-loj′i-k'l), *adj.* (١) هی ڕەگەز یا تۆخم.
(٢) هی ڕەگەز یا بنەچە دۆزینەوە: *( ~ tree)*

**genealogist** (jē´ni-al′ə-jist, jen´i-äl′ə-jist), *n.* ڕەگەزناس
ڕەگەز خوێنەرەوە

**genealogy** (jē´ni-ol′ə-ji, jen´i-äl′ə-ji), *n.* (١) ڕەگەزناسی؛
تۆخمناسی (٢) بنەچە؛ بنچینە (ڕەگەز). (٣) زنجیرەی بنەچە.

**general** (jen′ēr-əl, jen′rəl), *adj.* (١) گشتی؛ هەموویی؛ هەمەکی:
*( the ~ welfare)*
(٢) بڵاو؛ سەرانسەر: *( There is a ~ unrest in the country.)* .
(٣) تێکرا (٤) گشتی: *( the governer ~ )* .
(٥) ناتایبەتی؛ گشتی: *( He spoke in ~ terms.)*
(٦) گشتی؛ هەمەچەشنی؛ هی هەمووشتێک: *( a ~ store)* .

*n.* (١) بیری گشتی (٢) سەرۆکی کۆمەڵێکی ئاینی.
(٣) [Archaic]، جەماوەر.
(٤) جەنەڕاڵ (پلەی بەرزی ئەفسەری سوپا).

**in general,** بەگشتی؛ بەشێوەیەکی گشتی

**General Assembly,** (١) پەرلەمان؛ ئەنجوومەنی پەرلەمان
(٢) ئەنجوومەنی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان.

**General delivery,** (١) گەیاندنی پۆستە لە پۆستەخانەدا بە کەسانی
بێ ناونیشان (٢) لقی لێپرسراوی گەیاندنی ئەم جۆرە پۆستەیە لە
بەڕێوەبەرێتی پۆستەخانەدا.

**general election,** هەڵبژاردنی گشتی

**generalissimo** (jen´ēr-əl-is′ə-mō´), *n.* سوپاسالار؛
سەرۆکی سوپا یا هەموو هێزی چەکدار

**generality** (jen´ə-ral′ə-ti), *n.* (١) گشتێتی؛ هەموویێتی
(٢) بیروڕا یا ووتەیەکی گشتی یا گشتگرەوە: *( He spoke in ~ies.)*
(٣) زۆربە

**generalization** (jen´ēr-əl-i-zā′shən, jen´rəl-ī-zā′shən),
*n.* (١) گشتکاری؛ هەمەکی کردن (٢) بیرێکی گشتی.

**generalize** (jen′ēr-əl-īz´, jen′rəl-īz´), *v.t. & v.i.* گشتکاری؛
گشتکاری کردن؛ هەمەکی کردن.

**generally** (jen′ēr-əl-i, jen′rəl-i), *adv.* (١) بەگشتی؛ تێکڕا؛
بەشێوەیەکی گشتی؛ بەتێکڕایی (٢) بەزۆری؛ زۆربەی؛ زۆربەی کات.

**general officer,** ئەفسەری گەورە

**general practitioner,** پزیشکی گشتی پزیشکێکە کە پسپۆڕی لە
یەك بەشدا نەبێت. بەڵکو بەگشتی لە پزیشکەوانی بزانێت.

**generalship** (jen′ēr-əl-ship´, jen′rəl-ship´), *n.* (١) (ا) پلەو
دەسەڵاتی جەنەڕاڵ. (ب) کارامەیی جەنەڕاڵێك.
(٢) کارامەیی؛ لێهاتوویی سەرکردایەتی

**general staff,** بەشی ئەرکانی سوپا

**general store,** دووکانی گشتی کە هەموو جۆرە فرۆتەنییەکی تیادا
دەست دەکەوێت.

**general strike,** مانگرتنی گشتی

**generate** (jen′ə-rāt´), *v.t.* (١) منداڵبوون؛ هێنانە دنیاوە.
(٢) پەیداکردن؛ دروستکردن

**generation** (jen´ə-rā′shən), *n.* (١) منداڵبوون؛
منداڵ هێنانە دنیاوە (٢) پەیداکردن؛ دروستکردن؛ دروستبوون.
(٣) نەوە؛ بەرە؛ پشت.
(٤) ماوەی نەوە یا پشتێك (نزیکەی سی ساڵ)

**generative** (jen′ə-rā´tiv, jen′ēr-ə-tiv), *adj.* (١) هی منداڵبوون.
(٢) پەیداکەر؛ دروستکەر.

**generator** (jen′ə-rā´tēr), *n.* دینەمۆ

**generic** (jə-ner′ik), *adj.* (١) گشتی؛ هەمووی.
(٢) تۆخمی؛ تایبەتی بە تۆخمێك هەمووی نەك تەنها ئەندامێك:
*( Flower is a ~ name.)*
(٣) تایبەتی نییە بە یەك کۆمپانیا (دەرمان)؛ گشتی؛
نیشانەی کۆمپانیایەکی پێوە نییە: *( This is a ~ medicine.)*
-generically *(adv.)*.

**generosity** (jen´ə-ros′ə-ti), *n.* (١) دەستو دڵ تێری؛ بەخشندەیی؛
بەرچاوتێری؛ دەستکراوەیی؛ بدەیی؛ دڵئاوایی. (٢) کارێکی بەخشندەیی

**generous** (jen′ēr-əs), *adj.* (١) خانەدان؛ جوامێر؛ ڕەووشت جوان؛
ناسك. (٢) بدە؛ بەخشندە؛ دەستو دڵ تێر؛ دڵ ئاوەدان.
(٣) زۆر؛ فرە: *( ~ portions of food)* .

**genesis** (jen′ə-sis), *n.* (١) [G-] بەشی یەکەمی ئینجیل (کە باسی
دروستبوونی گێتی دەکات). (٢) سەرەتا؛ سەرچاوە؛ سەرەتای دروستبوون
یا پێکهاتن.

**genetic** (jə-net′ik), *adj.* (١) هی سەرەتا یا سەرچاوە؛ ڕەچەڵەکی.
(٢) هی زگماکی زانی؛ هی زانستی زگماکی.
-genetically *(adv.)*.

**geneticist** (jə-net′ə-sist), *n.* بۆماوەزان؛ زانای زگماکی.

**genetics** (jə-net′iks), *n.pl.* بۆماوەزانی؛ زانستی زگماکی.

**genial** (jēn′yəl), *adj.* (١) [Obs.]، تایبەتی بە ژنهێنانو شووکردن.
(٢) خۆش؛ باش؛ سازگار: *( a ~ climate)* .
(٣) ڕووخۆش؛ دۆستانە؛ گونجاو (ڕەووشت): *( a ~ disposition)* .
(٤) [Rare]، بلیمەتی.

**geniality** (jē´ni-al′ə-ti, jēn-yal′ə-ti), *n.* ڕووخۆشی؛
بە ئاسانی لەگەڵ ڕێکەوتن.

**genital** (jen′ə-t'l), *adj.* هی زاووزێ؛ هی کێروقوز؛
هی ئەندامی زاووزێ.

**genitalia** (jen´-tāl′yə, jen´ə-tā′li-ə), *n.pl.* = genitals.

**genitals** (jen′ə-t'lz), *n.pl.* ئەندامی زاووزێ؛ کێروقوز

**genitive** (jen′ə-tiv), *adj.* هی باری هەبوون (ڕێزمان).
*n.* (١) باری هەبوون (ڕێزمان).
(٢) ووشە یا شارستەیەك کە لەم بارەدا بێت.

**genitive case,** باری هەبوون (ڕێزمان).

**genius** (jēn′yəs, jē′ni-əs), *n.* (١) (ا) فریشتەی پارێزەر.
(ب) فریشتەی باشو خراپ.
(ج) کەسێك کە دەسەڵاتی زۆر بێت بەسەر کەسێکی تردا.
(٢) جنۆکە؛ درنج. (٣) سرووشتی تایبەتی گەل، چەرخ، یا جێگەیەك.
(٤) ( ~ to; ~ for )، مەیل؛ لێهاتوویی. (٥) بلیمەت.

**genocide** (jen′ə-sīd´), *n.* کۆمەڵ کوژی؛ گەل کوژی؛ جینۆسساید.
-genocidal *(adj.)*.

**genre** (zhän′rə), *n.* چەشن؛ جۆر؛ جۆری ویژە (پەخشان، شانۆنامە،
هۆنراوە).

**gent** (jent), *n.* [Slang], جوامێر یا پیاوچاك (لەڕووی سووکی یا
گاڵتەوە).

**genteel** (jen-tēl′), *adj.* (١) ڕەووشت جوان؛ ڕەفتار چاك؛ ناسك.
(٢) لە ڕادە بەدەر ڕەووشت جوانو ناسك.

**gentile** (jen′tīl), *n.* (١) کەسێك کە جوولەکە نەبێت؛ مەسیحیو
موسڵمان... هتد. (٢) کەسێکی بێ ئاین؛ کافر.
*adj.* (١) تایبەتی بە کەسێك کە جوولەکە نەبێت. (٢) بێ ئاین؛ کافر.
(٣) هی خێڵ، ڕەگەز، یا گەلێك

**gentle** (jen′t'l), *adj.* (١) خانەدان؛ بەگزادە.
(٢) ڕەووشت جوان؛ ڕەفتار چاك. (٣) [Archaic]، جوامێر.
(٤) دەستو دڵ فراوان؛ بەرەحم.
(٥) هێمن؛ لەسەرخۆ: *( a ~ dog; a ~ disposition)* .
(٦) نەرم؛ ناتوندوتیژ: *( a ~ rebuke)* .
(٧) هێواش؛ نەرم: *( a ~ breeze)* . (٨) بەرەبەرە: *( a ~ slope)*
*v.t.* (١) ماڵی کردن؛ ڕاهێنان؛ هێمن کردنەوە.
(٢) خانەدان کردن.

**the gentle sex,** ژن؛ ژنان؛ ئافرەت

**gentlefolk, gentlefolks** (jen′t'l-fōk′), *n.pl.* خانەدانان

**gentleman** (jen′t'l-mən), *n.* (١) خانەدانێك؛ خانەدان

(٢) جوامێر؛ پیاوچاك؛ پیاو؛ جێنتڵمان (٣) بەردەستی پیاوێكی گەورە.

(٤) (*pl.*) پیاوان؛ پیاو.

**gentleman-at-arms** (jen′t'l-mən-ət-ärmz′), *n.* پاسەوانی شای ئینگلتەرە

**gentleman-farmer** (jen′t'l-mən-fär′mēr), *n.* بەگزادە كشتیار كە سەرەوكاری زەوی‌وزارەكەی دەكات، بەڵام كاری تێدا ناكات.

**gentlemanly** (jen′t'l-mən-li), *adj.* جوامێرانە؛ بەرەووشت؛ پیاوانە

**gentleman's ( or gentlemen's ) agreement.** پەیمانی جوامێرانە: رێكەوتنێكی نەنووسراوی نێوان دوو لایە راگرتنی تەنها لەسەر بەڵێنی هەردوولا بەندە نەك لەسەر پەیوەندییەكی یاسایی.

**gentleman's gentleman,** بەردەستی بەگزادە.

**gentlewoman** (jen′t'l-woom′ən), *n.* (١) ئافرەتێكی خانەدان

(٢) ئافرەتێكی بەرەووشت. (٣) بەردەستی ئافرەتێكی خانەدان

**gently** (jen′tli), *adv.* (١) خانەدانانە *( ~ born)*.

(٢) جوامێرانە

(٣) لەسەرخۆ؛ بەنەرمی؛ بەناسكی؛ بەهێواشی؛ بەنەسپایی.

*( Speak ~ .; Treat the child ~ .)*

(٤) بەرەبەرە؛ وورده وورده: *( The hill sloped ~ .)*

**gentry** (jen′tri), *n.* (١) [Obs.] پلە بەرزی لە خێزانەوە بۆماوە.

(٢) خانەدانان

(٣) دەستە؛ كۆمەڵ (لەرووی گاڵتە یا سووكییەوە): *( the newspaper ~ )*.

**genu** (jē′nū), *n.* ئەژنۆ

**genuflect** (jen′yoo-flekt′), *v.i.* كرنووش بۆ بردن یا چۆك دادان (پەرستن)

-genuflection; genuflexion *(n.)*.

**genuine** (jen′ū-in), *adj.* (١) رەسەن. (٢) بوحت؛ پوختە؛ راستەقینە؛ گزی‌و فێڵی تێدا نییە. (٣) سەرراست؛ راستان؛ دڵپاك.

**genus** (jē′nəs), *n.* (١) چەشن؛ جۆر (٢) توخم؛ رەگەز

**geo-** (jē′ō, jē′ə), پێشگرێكە بەمانای زەمین؛ زەمینی

**geocentric** (jē′ō-sen′trik), *adj.* (١) وەك لە ناوەراستی زەمینەوە بپێورێت یا ببینرێت. (٢) ناوەراستێتی زەمین.

**geode** (jē′ōd), *n.* بەردێكە ناوەراستەكەی بۆ شەو بە بلوور گیراوە.

-geodesic *(adj.)*.

**geodesy** (jē-od′ə-si), *n.* ئەو لقەی بیركارییە كە لە رووی زەوی‌و پێوانی دەكۆڵێتەوە

**geographer** (jē-og′rə-fēr, jē-ôg′rə-fēr), *n.* جوگرافیناس؛ كیشوەرناس

**geographic** (jē′ə-graf′ik), *adj.* جوگرافی؛ كیشوەری

-geographical *(adj.)*; geographically *(adv.)*.

**geography** (jē-og′rə-fi, jē-ôg′rə-fi), *n.* جوگرافیا؛ زەمینناسی؛ رووی زەمین ناسی

**geological** (jē′ə-loj′i-k'l), *adj.* جیۆلۆجی؛ تایبەتی بە زەمین‌و ژێرزەمین زانی

-geologically *(adv.)*.

**geologist** (jē-ol′ə-jist), *n.* زانای جیۆلۆجی؛ زەمین‌و ژێرزەمین زان

**geology** (jē-ol′ə-jist), *n.* (١) جیۆلۆجی؛ زەمین‌و ژێرزەمین زانی

(٢) پەرتووك یا لێكۆڵینەوەیەكی جیۆلۆجی

**geometer** (jē-om′ə-tēr), *n.* ئەندازەناس؛ ئەندازیار

**geometric** (jē′ə-met′rik), *adj.* ئەندازەیی؛ شێوە؛ لەشێوەی ئەندازەیی پێكهاتوو؛ رێك‌وپێك (شێوە)

-geometrical *(adj.)*; geometrically *(adv.)*.

**geometrician** (jē′ə-mə-trish′ən, jē-om′ə-trish′ən), *n.* = geometer.

**geometry** (jē-om′ə-tri), *n.* (١) ئەندازە؛ زانستی ئەندازە.

(٢) پەرتووك یا لێكۆڵینەوەیەكی ئەندازە.

**geophagy** (jē-of′ə-ji), *n.* خاك خواردن.

**geophysics** (jē′ō-fiz′iks), *n.pl.* فیزیای زەمینی؛ جیوفیزیایی؛ زانستی پەیوەندی ناووهەواو باو ناو هەڵسان بە زەمینەوە.

-geophysical *(adj.)*.

**geopolitics** (jē′ō-pol′ə-tiks), *n.pl.* (١) زانستی پەیوەندی نێوان جوگرافیاو رامیاری؛ جیوپۆلەتیك. (٢) فەلسەفەی نازییەكان كە بریتی بوو لە داگیركردن.

-geopolitical *(adj.)*.

**geoponic** (jē′ə-pon′ik), *adj.* (١) كشتوكاڵی. (٢) لادێیی

**geoponics** (jē′ə-pon′iks), *n.pl.* زانست یا هونەری كشتوكاڵ

**geothermic** (jē′ō-thūr′mik), *adj.* هی گەرمایی ژێرزەمین.

**geranium** (ji-rā′ni-əm), *n.* ساردۆنیا.

**geriatrics** (jer′i-at′riks), *n.pl.* پزیشكەوانی پیران.

**germ** (jūrm), *n.* (١) تۆو

(٢) سەرچاوە؛ هەوێن: *( the ~ of an idea)*.

(٣) میكرۆب

**German** (jūr′mən), *adj.* ئەڵمانی (گەل، زمان، كلتوور).

*n.* (١) ئەڵمانی؛ كەسێكی ئەڵمانی (٢) زمانی ئەڵمانی.

**german** (jūr′mən), *adj.* (١) لە هەمان دایك‌و باوك بوو؛ برا یا خوشكی دایك‌و باوكی *( a brother- ~ ; a sister- ~ )*.

(٢) هەمان باپیر یا داپیریان هەیە. *( a cousin- ~ )*.

**germane** (jēr-mān′), *adj.* (١) پەیوەندیدار؛ پەیوەندی هەیە بە باسەكەوە؛ بەجێ. (٢) نزیك.

**Germanic** (jēr-man′ik), *adj.* (١) ئەڵمانی (وڵات، گەل).

(٢) تایبەتی بە زمانی ئەڵمانی كۆن.

*n.* (١) زمانی ئەڵمانی كۆن. (٢) لقێك لە زمانی هیندۆ-ئەورووپاییەكان كە ئینگلیزی‌و ئایسلەندی‌و زمانە ئەسكەندیناڤییەكان دەگرێتەوە.

**German measles,** سوورێژەی ئەڵمانی؛ دركە

**German shepherd dog,** سەگی شوانی ئەڵمانی: كە لە گورگ دەچێت‌و زیرەكە بۆ كاری پۆلیسی بەكاردەهێنرێت.

**Germany** (jūr′mə-ni), *n.* ئەڵمانیا.

**germicide** (jūr′mə-sīd′), *n.* میكرۆب كوژ.

**germinate** (jūr′mə-nāt′), *v.i. & v.t.* سەوزبوون؛ چەكەرەكردن؛ پشكوتن؛ رووان (تۆو).

-germination *(n.)*.

**gerontology** (jer′ən-tol′ə-ji), *n.* زانستی پیربوون‌و گیروگرفتی پیران.

**gerrymander** (ger′i-man′dēr, jer′i-man′dēr), *v.t.* (١)- دابەشكردنی ناوچەی هەڵبژاردن بەجۆرێك كە كەڵكی حیزبێكی زیاتر تێدا بێت لە حیزبێكی تر. (٢) كاری ناڕەوا كردن بۆ دەسكەوتی تایبەتی.

*n.* دابەشكردنی ناوچەی هەڵبژاردن بەجۆرێك كە كەڵكی زۆر بێت بۆ حیزبێك

**gerund** (jer′ənd), *n.* كرداری ناوی: كردارێكە كە وەك ناو لە رستەدا بەكاردەهێنرێت (رێزمان). (ووشەی " playing " لەم رستەیەدا).

( Playing the piano was one of his hobbies.)

**Gestapo** (gə-stä′pō, gə-stap′ō), *n.* پۆلیسی نهێنی ئەڵمانی.

**gestate** (jes′tāt), *v.t.* منداڵ هەڵگرتن لە سكدا

**gestation** (jes-tā′shən), *n.* (١) سكپڕی؛ ماوەی سكپڕی؛ سكداری؛ ئاووسی. (٢) گەڵاڵەكردنی بیرێك لە مێشكدا.

**gesticulate** (jes-tik′yoo-lāt′), *v.t.* ئیشارەتكردن بە دەست‌و چاو سەر لەكاتی دوواندا

*v.t.* دووان بە یارمەتی ئیشارەتكردنەوە.

**-gesticulation** *(n.)*; **gesticulator** *(n.)*.

**gesture** (jes′chẽr), *n.* (١) جوولانەوەی ئەندامی لەش (بەتایبەتی دەست و چاو) بۆ دەربڕینی بیروڕا؛ هێما. (٢) نیشانە.

*( His speech was a ~ of friendship.)*

*v.i.* نیشارەتکردن بە دەست و چاو بۆ بیروڕای خۆ دەربڕین.

**get** (get), *v.t.* (١) دەسکەوتن؛ دەستگیربوون؛ چنگ کەوتن؛ پەیداکردن.

(٢) گەیشتن (شوێن)؛ گەیین. *( We got home early.)*.

(٣) دەسکەوتن (بە تەلەفۆن یا بێ تەل). *( Did you ~ Paris?)*

(٤) هێنان؛ هاووردن. *( Go and ~ your books.)*.

(٥) گرتن (مرۆڤ).

(٦) فێربوون؛ لەبەرکردن؛ زانین.

(٧) والێکردن *( Please ~ him to leave.)*.

(٨) کردن؛ والێکردن. *( Can you ~ the door to shut?)*.

(٩) کردن *( He got his hands dirty.)*.

(١٠) بردن.

(١١) حوکم بەسەردا دران؛ زیندان (بەندیخانە) *( He got ten years.)*.

(١٢) ئامادەکردن *( Will you ~ breakfast for us?)*.

(١٣) زاین؛ بوون (منداڵ).

(١٤) [Colloq.]، پێویست بوون. *( He has got to pass the exam.)*.

(١٥) [Colloq.]، هەبوون؛ بوون. *( He has got red hair.)*.

(١٦) سەرسووڕماندن. *( This problem ~s me.)*.

(١٧) گرتن (بەندیخانە)؛ بریندارکردن؛ کوشتن.

(١٨) [Colloq.]، لێدان؛ پیادان. *( The blow got him in the eye.)*.

(١٩) [Colloq.]، تێگەیشتن. *( Do you ~ me?; I don't ~ you.)*.

(٢٠) [Slang]، پەستکردن.

(٢١) [Slang]، بینین؛ چاوپێکەوتن.

*( Did you ~ the look on his face?)*

*v.i.* (١) گەیشتن (شوێن)؛ هاتن. *( When do we ~ to New York?)*.

(٢) وا لێهاتن *( He got caught in the rain.)*.

*n.* (١) بەچکە. (٢) بوون (بەچکە، منداڵ).

**get about,** (١) جووڵانەوە؛ بزوان. (٢) گەڕان؛ سووڕانەوە.

(٣) بڵاوبوونەوە (دەنگوباس).

**get across,** [Colloq.], (١) ڕوونکردنەوە؛ پێ سەلماندن.

(٢) خەڵک لێ تێگەیشتن. (٣) تێگەیاندن.

**get ahead,** پێشکەوتن؛ سەرکەوتن.

**get ahead of,** پێش کەسێک یا کەسانی تر کەوتن.

**get along,** (١) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن؛ بەردەوام بوون.

(٢) ڕۆیشتن. (٣) سەرکەوتن؛ دەربردن لە ژیاندا.

(٤) پێکەوە گونجان؛ هەڵکردن لەگەڵ (مرۆڤ، گیاندار).

**get around,** (١) جووڵانەوە؛ بزوان. (٢) گەڕان؛ سووڕانەوە.

(٣) بڵاوبوونەوە (دەنگوباس).

(٤) بە فێڵبازی ئامانجی خۆ بەجێهێنان؛ خەڵەتاندن.

**get at,** (١) گەیشتن. (٢) کردن (کار).

(٣) دۆزینەوە (دەنگوباس)؛ بۆ دەرکەوتن.

(٤) [Colloq.]، کارتێکردن (بە بەرتیل یا ترساندن).

**get away,** (١) ڕۆیشتن. (٢) ڕاکردن؛ دەربازبوون.

(٣) دەستپێکردن (پێشبڕکێ).

**get away with,** [Slang], وەک بەرزەکی بانان بۆ دەرچوون؛ بۆ سەرگرتن؛ دەربازبوون لە سزا؛ بۆ لووان.

**get back,** (١) گەڕانەوە. (٢) دەستکەوتنەوە؛ هەڵگرتنەوە.

(٣) [Slang]. [~ at ]، تۆڵە لێ سەندن.

**get by,** (١) تێپەڕبوون.

(٢) [Colloq.]، کاری خۆی جێبەجێ دەکات بەبێ ئەوەی پێی بزانرێت یا سزا بدرێت. (٣) [Colloq.]، دەربردن؛ هەڵکردن.

*( It'll be a hard year, but we will get by.)*

**get down,** هاتنەخوارەوە؛ دابەزین.

**get down to,** دەستپێکردن.

**get in,** (١) چوونە ناو (کۆمەڵ)؛ بوون بە ئەندام یا بەشێک لە. (٢) گەیشتن. (٣) خستنە ناو.

**get it,** [Colloq.], (١) تێگەیشتن. (٢) سزا خواردن؛ سزا دران.

**get nowhere,** هیچ بە هیچ نەکردن؛ بە ئەنجام نەگەیشتن.

**get off,** (١) دابەزین (ئوتومبیل، شەمەندەفەر،ووڵاخ... هتد)؛ هاتنەخوارەوە. (٢) ڕۆیشتن. (٣) لابردن (پەڵە، لەکە)؛ جل داکەندن.

(٤) ڕاکردن؛ دەربازبوون. (٥) (ا) ڕزگارکردن لە سزا. (ب) سزا کەمکردنەوە.

(٦) دەستپێکردن (ملەملێ). (٧) ڕرتاندن یا دەرپەڕاندن (نوکتە، ووتە)

**get on,** (١) جل کردنەبەر. (٢) پێشکەوتن؛ سەرکەوتن.

(٣) چوونە تەمەنەوە؛ گەورەبوون. (٤) سواربوون (ووڵاخ، ئوتومبیل).

(٥) لە ژیاندا سەرکەوتن؛ دەربردن. (٦) گونجان؛ هەڵکردن لەگەڵدا.

**get out,** (١) چوونەدەرەوە؛ هاتنەدەرەوە. (٢) ڕۆیشتن.

(٣) هێنانەدەرەوە. (٤) ئاشکرابوون. (٥) بڵاوکردنەوە.

**get out of,** (١) لێ چوونەدەرەوە. (٢) لێ دەربازبوون؛ لێ دەربازکردن؛ لێ ڕزگارکردن. (٣) لە چاو وون بوون

(٤) لێ دەرکێشان یا لێ دەرهێنان (دەنگوباس). (٥) لێ دەسکەوتن.

**get over,** (١) چاکبوونەوە (نەخۆشی). (٢) لەبیرچوونەوە (کارەسات)؛ لە دڵ دەرچوون. (٣) (ا) لێ پەڕینەوە. (ب) تێگەیاندن؛ پێ گەیاندن (بیر).

**get there,** [Colloq.], سەرکەوتن.

**get through,** (١) تەواوکردن؛ لێبوونەوە (کار).

(٢) دەربردن؛ هەڵکردن؛ مان. (٣) پەیوەندی پێوەکردن (تەلەفۆن).

(٤) تێگەیاندن

**get to,** [Colloq.], (١) بە ئەنجام گەیشتن.

(٢) تێگەیاندن؛ پەیوەندی پێوەکردن؛ بیروڕای خۆ پێ گەیاندن.

(٣) کارتێکردن (بە بەرتیل یا ترساندن).

**get together,** (١) کۆکردنەوە؛ پێک پێکرتن. (٢) کۆبوونەوە؛ یەکگرتن.

(٣) [Colloq.]، ڕێکەوتن؛ پەیمان بەستن.

**get up,** (١) هەڵسان (لە خەو، جێگە، کورسی). (٢) ڕێ خستن

(٣) پێشکەوتن. (٤) پیادا سەرکەوتن یا هەڵگەڕان (شاخ، دار).

**getaway** (get′ə-wā′), *n.* (١) دەستپێکردن (ملەملێ)

(٢) ڕاکردن؛ دەربازبوون

**get-together** (get′tə-geth′ẽr), *n.* کۆبوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی؛ چاو بەیەک کەوتن؛ سەر لە یەکتری دان.

**geyser** (gī′zẽr, gī′sẽr), *n.* (١) گایزەر؛ فووارەی سرووشتی گەرم؛ کانیەیەکی گەرمە ناوبەناو وەک فووارە هەڵدەچێت.

(٢) [British]، مەکینەی ئاو گەرم کردن.

**ghastly** (gast′li, gäst′li), *adj.* (١) ترسناک؛ سامناک.

(٢) زەرد هەڵگەڕاو؛ ناشرین. (٣) [Colloq.]، خراپ؛ بەد؛ ناخۆش.

**-ghastliness** *(n.)*.

**ghetto** (get′ō), *n.* (١) گەڕەکی جوولەکەکان

(٢) گەڕەکی کەمایەتییە نەتەوەییەکان (کە گەلێک جار وەک وێرانە وایە).

**ghost** (gōst), *n.* (١) گیان؛ ڕۆح. (٢) خێو؛ تارمایی مردوو.

(٣) یادێکی ناخۆش.

(٤) بە ئاستەم؛ نەختێک. *( not a ~ of a chance)*.

(٥) [Colloq.]، نووسەرێک کە پەرتووکێک یا شتێک دەنووسێت بۆ پیاوێکی گەورە بەناوی ئەوەوە. (٦) [G-]، گیانی پیرۆز (خاچ پەرستی)

*v.i. & v.t.* نووسینی شتێک بۆ پیاوێکی گەورە بەناوی ئەوەوە.

**ghostly** (gōst′li), *adj.* (١) وەک خێو یا دەعبا؛ خێوانە

(٢) گیانی؛ ئاینی.

**ghost town,** شاری چۆڵ؛ شاری چۆڵکراو؛ شاری خێوان؛ چۆڵەوانی.

**ghost writer,** نووسەرێک کە ووتار و پەرتووک بۆ کەسێکی تر دەنووسێت بەناوی ئەوەوە

**ghoul** (gōōl), *n.* (١) دەعبایەکی ئەفسانەییە گۆڕ هەڵدەکەنێ و گۆشتی

مردووەکان دەخوات. (٢) گۆڕ ڕووتکەرەوە (مرۆڤ)
(٣) کەسێکی بەدکردەوە؛ کەسێکە کە حەز لە شتی پیس دەکات.

**-ghoulish** *(adj.)*.

**GI, G.I.** (jē′ī′), *adj.* هی سەربازی ئەمەریکا

*n.* [Colloq.], سەرباز

**giant** (jī′ənt), *n.* (١) گیاندارێکی ئەفسانەیی زۆر زل
(٢) (أ) ڕەبەلاح؛ فیلەتەن. (ب) کەسێکی زۆر لێهاتوو؛ کەسێکی گەورە یا مەزن.

*adj.* گەورە؛ مەزن؛ زل

**gibber** (jib′ẽr, gib′ẽr), *v.i. v.t.* قسەی بێ مانا کردن؛ چەقەچەق کردن

*n.* وتەی بێ مانا؛ چەقەچەق؛ وڕێنە

**gibberish** (jib′ẽr-ish, gib′ẽr-ish), *adj.* قسەی بێ مانا؛ قسەی قۆڕ؛ چەقەچەق.

**gibbet** (jib′it), *n.* سێدارە؛ قەنارە

*v.t.* (١) لە سێدارەدان؛ هەڵواسین (٢) خستنە بەردەمی خەڵك بۆ گاڵتەپێکردن.

**gibbon** (gib′ən), *n.* جۆرە مەیموونێکی باریکەڵەی بچووکە.

**gibe** (jīb), *v.i. & v.t.* گاڵتەپێکردن؛ توانج تێگرتن

*n.* گاڵتە؛ توانج؛ گاڵتەپێکردن؛ قەشمەری.

**giblet** (jib′lit), *n.pl.* سیقەتوورەو دڵو جگەری مریشكو باڵندەی تر

**giddiness** (gid′i-nis), *n.* گێژی؛ وڕی؛ سەرخوولانەوە

**giddy** (gid′i), *adj.* (١) گێژ؛ وڕ (٢) حولحوڵی؛ بێ بار

**giddyap or giddyup,** *interj.* تێخوڕینی ئەسپ بۆ خێرا ڕۆیشتن.

**-giddily** *(adv.)*.

**gift** (gift), *n.* (١) دیاری؛ خەڵات.
(٢) بەهرە؛ توانای زگماکی؛ لێهاتوویی سرووشت کردە:
*( Shakepeare had a great ~ .)*

**look a gift horse in the mouth,** کەموکوڕی دۆزینەوە لە دیارییەکدا

**gifted** (gif′tid), *adj.* بەبەهرە؛ بەهرەدار؛ بەهرەوەر؛ لێهاتوو.

**gift-wrap** (gift′rap′), *v.t.* پێچانەوەی دیاری بە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ.

**gig** (gig), *n.* (١) عەرەبانەیەکی یەك ئەسپی دوو پێچکەی سەر بەتاڵ.
(٢) بەلەمی سەوڵو بایەوان (بەشێکە لە کەشتیو کاپتن بەکاری دەهێنێت).
(٣) بەلەمی خێرای سەوڵ (ملەملێ).

**gig** (gig), *n.* ڕمی ڕاوەماسی

*v.t. & v.i.* ڕاوەماسی کردن بە ڕم

**gig** (gig), *n.* [Slang], (١) تاوان (قوتابی، سەربازن؛ لاساری.
(٢) سزای ئەم جۆرە تاوانە.

*v.t.* سزادان

**gigantic** (jī-gan′tik), *adj.* زۆر زل؛ زۆر گەورە؛ فیلەتەن

**-gigantically** *(adv.)*.

**giggle** (gig′′l), *v.i.* لەژێر لێوەوە پێکەنین

*n.* پێکەنینی لەژێر لێوەوە.

**-giggler** *(n.)*; giggly *(adj.)*.

**gigolo** (jig′ə-lō′), *n.* (١) پیاوێکە کە ئافرەتێکی دۆستی بەخێوی دەکات
(٢) پیاوێکە کە بەکرێ دەگیرێت بۆ سەماکردن لەگەڵ ئافرەتدا یا چوونەدەرەوە لەگەڵیاندا

**gild** (gild), *v.t.* (١) زەرکەش کردن؛ لە ئاڵتوون گرتن.
(٢) ڕازاندنەوە؛ جوانکردن؛ ڕووکەش کردن.

**gild the lily,** ڕازاندنەوەی ناپێویستی شتێك کە خۆی لە خۆیدا جوان بێت.

**-gilder** *(n.)*.

**gilding** (gil′diŋ), *n.* (١) زەرکەش کردن؛ لە ئاڵتوون گرتن.
(٢) زێری زەرکەش کردن؛ بۆیەی زێڕین. (٣) ڕووکەش.

**gill** (gil), *n.* (١) هەناسەکێشی ماسی؛ کەوانەی ڕیشەدار.
(٢) (pl.) (أ) گۆشتی بەرملی کەڵەشێرو قەلەموون. (ب) غەبغەبە (مرۆڤ).

**gill** (jil), *n.* پێوانەیەکی شلەیە سێ‌ودوویەکی گالۆنێکە.

**gill** (jil), *n.* یار (کچ)؛ دۆست (ئافرەت).

**gill** (gil), *n.* (١) چەم؛ چەمێکی چڕ. (٢) جۆگەلە؛ جۆگە.

**gilt** (gilt), *alternative past tense and p.p. of* **gild.**

*adj.* زەرکەش کراو؛ لە ئاڵتوون گیراو.

*n.* زەرکەش؛ زێری زەرکەش؛ بۆیەی زێڕین.

**gilt** (gilt), *n.* [Dial.], بەچکە بەرازی مێینە.

**gimlet** (gim′lit), *n.* درەوشە.

*v.t.* بە درەوشە کونکردن.

**gimmick** (gim′ik), *n.* (١) فێڵ‌وتەڵەکەی جادووگەر.
(٢) فێڵ‌وتەڵەکە. (٣) ڕێگە. هۆ، فێڵ، یا ئامێرێکی تازەیە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتێك یا گەیشتن بە مەبەستێك.

**gin** (jin), *n.* جن: خواردنەوەیەکی ئەلکحولی سەرخۆشکەرە

**gin** (jin), *n.* (١) تەڵە؛ تەپکە. (٢) مەکینەی شت بەرزکەرەوە.
(٣) جینکەنە؛ مەکینەی جیاکردنەوەی پەموو لە تۆوەکەی.

*v.t.* (١) گرتن بە تەڵە یا تەپکە (٢) پەموو جیاکردنەوە لە تۆوەکەی

**ginger** (jin′jẽr), *n.* (١) زەنجەفیل. (٢) ڕەنگێکی لمین یا سووربار
(٣) [Colloq.]. جۆش؛ تین

*v.t.* (١) زەنجەفیل تێکردن (٢) تین پێدان؛ خستنە جۆش.

**ginger ale,** خواردنەوەیەکی گازاوی سەرخۆش نەکەرە

**ginger-bread** (jin′jẽr-bred′), *n.* (١) کێکی زەنجەفیل تێکراو
(٢) شتی ڕازێنەرەوەی زەق و هەرزانبەها.

*adj.* زەق و هەرزانبەها

**gingerly** (jin′jẽr-li), *adv.* بەترسەوە؛ بە وریایی؛ بە پارێزەوە.

*adj.* ترسنۆك؛ وریا؛ گوێ قوڵاخ.

**gingivitis** (jin′jə-vī′tis), *n.* هەوکردنی پووك.

**gin mill,** [Slang], مەیخانە.

**gin rummy,** جۆرە یارییەکی کاغەزە.

**ginseng** (jin′seŋ), *n.* گیایەکی بۆن خۆشی چینییە (بۆ دەرمان بەکاردێت‌و چای لێ دروستدەکرێت).

**gip** (jip), *n., v.t. & v.i.* = gyp.

**gipsy** (jip′si), *n.* = gypsy.

**gipsy moth,** = gypsy moth.

**giraffe** (jə-raf′, jə-räf′), *n.* زەڕافە؛ حوشترمل.

**gird** (gũrd), *v.t.* (١) دەورەدان بە پشتێن.
(٢) قایم کردن یا توندکردن بە پشتێن. (٣) دەورەدان
(٤) خەڵات کردن. (٥) خۆ گورج کردنەوە یا ئامادەکردن بۆ کردار

**gird** (gũrd), *n., v.i. & v.t.* گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین؛ قەشمەری پێکردن.

**girder** (gũr′dẽr), *n.* نیرگە؛ شێلمان.

**girdle** (gũr′d'l), *n.* (١) پشتێن؛ کەمەربەند؛ قایشی پشت
(٢) شتی دەورەدەر. (٣) کەمەرە (ئافرەت).
(٤) بازنەی دەوری قەدی دارێك پاش توێکڵ لێکردنەوەی.
(٥) ئێسقان یا کەوانەی ئێسقانی چەسپاندنی لاق و باڵ.

*v.t.* (١) پشتێن بەستن؛ بە پشتێن یا قایش دەورەدان. (٢) دەورەدان
(٣) بازنە دروستکردن لەسەر قەدی دار بە لێکردنەوەی توێکڵەکەی

**girdler** (gũr′dlẽr, gũr′d'l-ẽr), *n.* (١) پشتێن یا کەمەربەند دروستکەر. (٢) دەورەدەر (مرۆڤ، شت). (٣) جانەوەرێکە لەسەر توێکڵی دار دەژی (بازنە دروست دەکات لەسەر قەدی دارەکە بە خواردنی توێکڵەکەی)

**girl** (gũrl), *n.* (١) کچ (٢) ئافرەت (شووکردوو یا نەکردوو)
(٣) بەردەستی کچ (٤) [Colloq.]. یار؛ دڵدار.

**girlhood** (gũrl′hood), *n.* (١) کچێنی؛ کاتی کچێنی؛ کچێتی
(٢) کچان.

**girlish** (gũr′lish), *adj.* کچانە؛ کچانی

**girl scout,** ئەندامێکی دیدەوانی کچان.

**Girl Scouts,** دیدەوانی کچان.

**girth** (gûrth), ***n.*** (١) تەنگەی ئەسپ‌و کەرو هێستر؛ قایشی قەیاسە؛ قەیاسە. (٢) کەمەرەی مرۆڤ یا درەخت؛ بازنە (قەدی مرۆڤ یا دار).
(٣) پشتێن؛ کەمەربەند؛ کەمەرە.

***v.t.*** (١) دەورەدان (٢) تەنگە توندکردنەوە یا قایم کردن؛ بە قایش توندکردنەوە.

***v.i.*** بازنەی قەد بێوان.

**gist** (jist), ***n.*** (١) بنچینەو هۆی داوایەك لە دادگادا.
(٢) پوختە مەسەلە، ووتار، بیروبڕوا؛ ناوەڕۆك.

**give** (giv), ***v.t.*** (١) دان؛ پێدان؛ دانەدەست؛ پێشکەش کردن.
(٢) پێ بەخشین؛ پێدان (بەخشیش)
(٣) دانەوە؛ دەربڕین. *( to ~ a reply)*.
(٤) پێشکەش کردن؛ کردن *( They gave a concert.)*.
(٥) دان بەسەردا (سزا)

***v.i.*** (١) دان؛ پێدان؛ دیاری پێدان.
(٢) چەمینەوە؛ شکان؛ ڕووخان؛ پسان:
*( The floor gave under the weight of the piano.)*
(٣) کشان؛ مل دان‌و هەڵبەزینەوە

***n.*** (١) پسان؛ چەمینەوە؛ شکان (٢) کشان

**give and take,** ئالوگۆڕکردن؛ دان‌و سەندن؛ گۆڕینەوە.

**give away,** (١) بەخشین؛ پێدان (بەخشیش)؛ دان بە خۆڕایی؛ بەخشینەوە
(٢) کچ دان بە شوو *( to give away in marriage)*
(٣) [Colloq.]. ئاشکراکردن؛ دەرخستن (نهێنی).

**give back,** گەڕاندنەوە؛ پێدانەوە؛ دانەوە (شت)

**give forth,** لێ هاتن (بۆن)؛ دانەوە (بۆن)

**give in,** (١) دانەدەست (٢) وازهێنان؛ مل دان؛ کۆڵ دان.

**give it to,** [Colloq.]. سەرزەنشت کردن؛ سزادان؛ لێدان.

**give off,** دانەوە (بۆن)؛ لێوەهاتن.

**give out,** (١) دانەوە (بۆن)؛ لێوەهاتن
(٢) بلاوکردنەوە (نهێنی)؛ خستنەڕوو.
(٣) بەخشینەوە؛ دابەشکردن.
(٤) سووان؛ نەمان؛ پەککەوتن

**give over,** (١) دانەدەست؛ دان بەدەستەوە (٢) وەستان

**give up,** (١) دانەدەست؛ دان بەدەستەوە؛ پێدان
(٢) وازهێنان؛ کۆڵ دان؛ دەست هەڵگرتن (٣) هیوا بڕین.
(٤) تەرخان کردن؛ بەخت کردن

**give way,** شکان؛ پسان؛ هەرەس بردن؛ ڕووخان؛ پچڕان:
*( The rope gave way.)*

**give-and-take** (giv′ən-tāk′), ***n.*** ئالوگۆڕکردن؛ گۆڕینەوە؛ دان‌و سەندن

**giveaway** (giv′ə-wā′), ***n.*** [Colloq.]. (١) ئاشکراکردنێکی بێ دەستەنقەست (نهێنی) (٢) شتێکی خۆڕایی یا زۆر هەرزانبەها.

***adj.*** [Colloq.]. تایبەتی بە بەرنامەیەکی ملەملێی تەلەفزیۆن یا ڕادیۆ کە خەلاتی تیا دەدرێت

**given** (giv′'n), *past participle of* give.

***adj.*** (١) دراو؛ حەلات؛ دیاری؛
(٢) ڕاهاتوو؛ خووپێوەگر *( He is ~ to drink.)*
(٣) دیاریکراو؛ تایبەتی (٤) گریمانە
(٥) بلاوکراوە (یاسا)؛ کراو.

**given name,** ناوی یەکەمی کەسێك؛ ناوی خۆ؛ ناو

**giver** (giv′ēr), ***n.*** بدەر؛ بەخشندە *( alms~ , law~ )*.

**gizzard** (giz′ērd), ***n.*** (١) سیقەتورە؛ جیقلدانە؛ جیکلدانە.
(٢) [Colloq.]. سك (لە ڕووی پێکەنینەوە)

**glacial** (glā′shəl, glā′shi-əl), ***adj.*** (١) سەهۆڵین؛ بەفرین؛ هی ڕووبار یا شاخی سەهۆڵین (٢) زۆر سارد
(٣) تایبەتی بە چەرخی سەهۆڵین

**glacial epoch,** چەرخی سەهۆڵین؛ چەرخی سەهۆڵ

**glaciate** (glā′shi-āt′), ***v.t.*** (١) (ا) بە سەهۆڵ داپۆشین؛ بە ڕووباری سەهۆڵین داپۆشین. (ب) بەستن؛ بوون بە سەهۆڵ.
(٢) ڕووکەشێکی سەهۆڵین کردن

**glacier** (glā′shēr), ***n.*** شاخی سەهۆڵین؛ ڕووباری سەهۆڵین؛ بەستەڵەکێکی گەورە بەسەر شاخێکەوە کە قەت ناتوێتەوە.

**glacis** (glā′sis, glas′is), ***n.*** بەرەوخوارکەیەکی کەم؛ بەرەوژوورکەیەکی کەم.

**glad** (glad), ***adj.*** (١) بەختیار؛ دلشاد؛ دڵخۆش.
(٢) دڵخۆشکەر؛ دڵشادکەر: *( ~ tidings)*.
(٣) جوان؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ گەش (ڕەنگ).

**gladden** (glad′'n), ***v.t.*** دڵخۆشکردن؛ بەختیارکردن؛ شادکردن.

***v.i.*** دڵخۆش بوون؛ بەختیاربوون؛ شادبوون.

**glade** (glād), ***n.*** (١) ڕووتەنی نێوان دارستانێك
(٢) ڕۆنگ؛ ڕۆنگاو.

**glad eye,** [Slang], سەیرکردنێکی چاوباشقاڵانە
*[ to give ( or get ) the ~ ) ]*

**gladiator** (glad′i-ā′tēr), ***n.*** زۆرانبازێك بەتایبەتی بەند یا دەستبەسەر کە زۆرانی دەگرت لەگەڵ دڕندە یا زۆرانبازی تر هەتا مردن بۆ کەیف‌و خۆشی تەماشاکەران لە ڕۆمای کۆندا.

**gladiola** (glad′i-ō′lə, glə-dī′ə-lə), ***n.*** = **gladiolus.**

**gladiolus** (glad′i-ō′ləs, glə-dī′ə-ləs), ***n.*** گلادیۆلا؛ گوڵە سەوسەن؛ گوڵە زەنبەق

**gladly** (glad′li), ***adv.*** بە خۆشییەوە؛ بە خۆشی؛ بە خۆشی خۆ.

**gladsome** (glad′səm), ***adj.*** (١) شادکەر؛ خۆش
(٢) شاد؛ ڕووخۆش؛ دڵخۆش

**glamor** (glam′ēr), ***n.*** = **glamour.**

**glamorize** (glam′ēr-īz′), ***v.t.*** بە خۆش‌و کەشخە پیشاندان.

**glamorous** (glam′ēr-əs), ***adj.*** خۆش‌و کەشخە (ژیان).

**glamour** (glam′ēr), ***n.*** (١) جادوو؛ جادووگەری.
(٢) خۆشی‌و کەشخەیی (ژیان).

**glamourous** (glam′ēr-əs), ***adj.*** = **glamorous.**

**glance** (glans, gläns), ***v.i.*** (١) لابەلا پیادان‌و هەڵگەڕانەوە (گوللە، بەرد). (٢) ناوبردن (٣) شەوقدانەوە (٤) سەیرکردنێکی پەلەو کورتوبڕ؛ چاو پیاخشان؛ چاو پیاڕوانین؛ چاو پیاگێران.

***v.t.*** لابەلا پیادان‌و هەڵگەڕانەوە.

***n.*** (١) لابەلا پیادان‌و هەڵگەڕانەوە (٢) شەوق؛ بریقە.
(٣) سەیرکردنێکی کورت؛ سەیرکردن؛ چاو پیاخشان؛ چاو پیاگەڕان

**gland** (gland), ***n.*** لوو؛ گلاند؛ ڕژێن.

**glanders** (glan′dērz), ***n.pl.*** مقاو: نەخۆشییەکی ئەسپ‌و وولاخی تر.

**glandular** (glan′joo-lēr), ***adj.*** وەك لوو؛ هی لوو؛ لوویی.

**glans** (glanz), ***n.*** (١) سەری کێر. (٢) میتکە؛ قیتکە.

**glare** (glâr), ***v.i.*** (١) گەشانەوە؛ بریقەدانەوە. (٢) زۆر بریقەداربوون.
(٣) لێ مۆڕبوونەوە؛ خێسەکردن؛ چاوبزکردنەوە.

***n.*** (١) بریقە؛ بریقەیەکی زۆر؛ گڕ.
(٢) مۆڕبوونەوە؛ خێسە؛ خێسەکردن؛ چاوبزکردنەوە؛ مۆڕە.
(٣) نوواندنێکی بریقەدار.

**glare** (glâr), ***n.*** ڕووییەکی ساف‌و بریقەدارو شووشەیی وەك سەهۆڵ.

***adj.*** ساف‌و بریقەدار.

**glaring** (glār′iŋ), ***adj.*** (١) بریقەدار؛ گەش. (٢) زەق.
(٣) مۆڕە؛ خێسە.
(٤) ئاشکرا؛ ڕوون؛ دیار؛ هەڵماڵراو: *( a ~ mistake)*.

**glary** (glâr′i), ***adj.*** = **galring.**

**glass** (glas, gläs), ***n.*** (١) شووشە. (٢) دەفری شووشە.
(٣) پەرداخ (٤) (ا) تیلیسکۆپ؛ گەردبین. (ب) (*pl.*) دووربین. (ج) چاویلکە.

(٥) پڕ پەرداخێك؛ پەرداخێك: *( He drank a ~ of milk.)* .

*v.t.* (١) بە شووشە دەورگرتن (٢) خستنە دەفری شووشەوە بۆ پاراستن.

(٣) دانەوە (شەوق) (٤) ڕووەکەی وەك شووشە لێکردن.

*adj.* شووشە: هی شووشە؛ لە شووشە کراو

**glass blowing,** فووکردنە شووشەی تواوە بۆ پێکهێنانی شێوەی ویستراو

**glassful** (glas′fool′, gläs′fool′), *adj.* پڕ پەرداخێك

**glass-house** (glas′hous′, gläs′hous′), *n.* خانووی شووشە (بۆ پەروەردەکردنی ڕووەك)

**glassiness** (glas′i-nis, gläs′i-nis), *n.* شووشەیی

**glassmaker** (glas′māk′ẽr, gläs′māk′ẽr), *n.* شووشە دروستکەر: شووشەکەر

**glassman** (glas′mən, gläs′mən), *n.* (١) شووشەفرۆش؛ دەفری شووشەفرۆش (٢) شووشەکەر.

**glassware** (glas′wâr′, gläs′wâr′), *n.* دەفری شووشە

**glasswork** (glas′wûrk′, gläs′wûrk′), *n.* (١) کارگەی شووشە

(٢) دەفری شووشەکردن و ڕازاندنەوە (٣) دەفری شووشە.

-glassworker *(n.)*.

**glassy** (glas′i, gläs′i), *adj.* (١) شووشەیی: ساف؛ ڕۆشن

(٢) سارد و بێ هەست. *( a ~ stare)* .

**glaucoma** (glô-kō′mə), *n.* ئاوی ڕەش داهاتن (نەخۆشی چاو)

**glaucous** (glô′kəs), *adj.* (١) سەوز: سەوزی شینباو

(٢) ئاوکێکی سپی پێوەیە (وەك هەندێ تری یا گەڵای کەلەرم یا هەڵووژە).

**glaze** (glāz), *v.t.* (١) (أ) پەنجەرە خستنە خانووەوە.

(ب) شووشە خستنە چوارچێوەی پەنجەرەوە.

(٢) ڕووکەش وەك شووشە لێکردن (گۆزەودیزەو قاپ و دەفری تر).

*v.i.* وەك شووشە لێهاتن؛ ساف و لووس بوون.

*n.* (١) ڕووکەشی شووشەیی لەسەر گۆزەودیزەو دەفری تر

(٢) بۆیەی شووشەیی (٣) تارمایی سەر چاو

**glazier** (glā′zhẽr), *n.* (١) شووشەچی که شووشە دەبڕێت و دەیخاتە پەنجەرەوە (٢) ڕووکەشی شووشەبیدەر لە گۆزەودیزەو دەفری تر

**glazing** (glā′ziŋ), *n.* (١) شووشەچێتی: شووشە بڕین و خستنە پەنجەرەوە (٢) شووشەی ئامادەکراو بۆ خستنە چوارچێوەوە

(٣) ڕووکەشی شووشەیی (٤) بۆیەی شووشەیی

(٥) بۆیەی شووشەیی لە ڕووی گۆزەو دیزەو دەفری تر دان

**gleam** (glēm), *n.* (١) کلپە: برووسکە؛ شەوقێکی سەردەمی؛ گڕنگ

(٢) تروسکە (٣) ڕووناکی (تێگەیشتن، هیوا)

*v.i.* (١) درەوشانەوە؛ برووسکەدانەوە؛ شەوقدانەوە.

(٢) دەرکەوتن یا پیشاندانێکی لەپڕ و سەردەمی.

**glean** (glēn), *v.t. & v.i.* (١) چنینەوە: زەرتك چنینەوە؛ کۆکردنەوە.

(٢) کۆکردنەوە یا چنینەوەی بەرەبەرە (دەنگوباس، ڕاستی، زانیاری).

**gleanings** (glēn′iŋz), *n.pl.* زەرتك؛ شتی کۆکراوە یا چنراوە.

**glee** (glē), *n.* (١) خۆشی و شادی؛ کەیف

(٢) گۆرانییەکە بۆ سێ گۆرانی بێژی تاك تاك بەبێ مۆسیقا.

**glee club,** دەستە یا تیپی گۆرانی.

**gleeful** (glē′fəl), *adj.* شاد؛ بەختیار

**gleet** (glēt), *n.* (١) [Obs.] شتی لینج.

(٢) هەرچی شتێك لەش دەری بدات لە ئەنجامی نەخۆشیدا.

(٣) دەردراوی ئەنجامی ئاتەشەك. (٤) چڵمی ئەسپ.

*v.i.* پیسایی یا شتی لینج لێ هاتنەدەرەوە (وەك چڵم یا دەردراوی ئاتەشەك).

**glen** (glen), *n.* دۆڵ

**glib** (glib), *adj.* (١) لامسەرلایی (٢) (أ) زمانپاراو؛ دەم ڕاست.

(ب) زمان لووس؛ زمانباز؛ زمانزان

**glide** (glīd), *v.i.* (١) خشان: کشان؛ خشکەکردن؛ خلیسکان

(٢) تێپەڕبوون بە خشپە (کات)

(٣) هاتنەخوارەوە بەبێ مەکینە بەکارهێنان (فڕۆکە).

(٤) خشان یا خشکەکردن (دەنگناسی).

*n.* (١) خشکە؛ کشان؛ خلیسکان.

(٢) هاتنەخوارەوەی فڕۆکە بەبێ مەکینە بەکارهێنان.

(٣) بەسەردا خشان یا خلیسکانی تیپ یا دەنگێك (دەنگناسی).

**glider** (glī′dẽr), *n.* (١) بە خشپە یا خلیسکان ڕۆیشتن (مرۆڤ، شت).

(٢) فڕۆکەی بێ مەکینە

(٣) کورسی یا قەنەفەیەك کە وەك جۆلانێ هاتوچۆ دەکات (بۆ هەیوان)

**glim** (glim), *n.* [Slang], (١) ڕووناکی؛ چرا؛ مۆم (٢) چاو.

**glimmer** (glim′ẽr), *v.i.* (١) تروسکانەوە؛ پرتەپرت کردن

(٢) بە ئاستەم دیاربوون

*n.* (١) تروسکە؛ پرتە؛ ڕۆشنایی؛ تروسکایی.

(٢) دیاربوونێکی کەم؛ دەرکەوتنێکی کز؛ تروسکە: *( a ~ of hope)*

**glimpse** (glimps), *v.t. & v.i.* چاو پیاخشاندن؛ ڕوانین بۆ ماوەیەکی کورت؛ سەیرکردن بۆ ماوەیەکی کورت.

*n.* (١) تروسکە؛ ڕۆشنایی؛ پرتە؛ بریسکە. (٢) دەرکەوتنێکی کورت.

(٣) سەیرکردنێکی کورت؛ چاو پیاخشاندن؛ چاوپێکەوتنێکی گورج.

**glint** (glint), *v.i.* (١) درەوشانەوە؛ شەوقدانەوە.

(٢) وەك برووسکە بزوان یا تێپەڕبوون.

*n.* (١) شەوق؛ درەوشانەوە. (٢) [Dial.] ، سەیرکردنێکی کورت

**glisten** (glis′'n), *v.i. & n.* بریقەدانەوە؛ شەوقدانەوە؛ درەوشانەوە؛ تریفەهاتن؛ بریسکەدانەوە.

**glister** (glis′tẽr), *v.i. & n.* [Archaic], = glisten.

**glitter** (glit′ẽr), *v.i.* (١) بریسکەدانەوە؛ بریقەدانەوە؛ درەوشانەوە؛ تریفەهاتن. (٢) بە جوان هاتنە بەرچاو؛ بریسکە هاتن؛ بریقەدانەوە

*( All is not gold that ~s .)*

*n.* (١) بریسکە؛ بریسکە بریسك؛ تریفە؛ درەوشانەوە.

(٢) بریقە؛ جوانییەکی بریقەدار و لە ڕادە بەدەر خۆنوێن؛ بریقەبریق

**glittery** (glit′ẽr-i), *adj.* بریسکەدار؛ بریقەدار؛ شەوقدەرەوە

**gloat** (glōt), *v.i.* ( ~ over ), لە ڕادە بەدەر پێ خۆش بوونێکی نابەجێ: *( to ~ over the misfortunes of an enemy; a miser ~ing over his gold)*

**global** (glō′b'l), *adj.* (١) خڕ.

(٢) جیهانی؛ گێتیتی: *( ~ warfare)* .

**globalization** (glō′b'l-ī-zā′shən), *n.* جیهانگەری.

**globe** (glōb), *n.* (١) خڕەی زەوی. (٢) جیهان؛ سەرزەمین؛ گێتی

(٣) شتێکی خڕ (گڵۆپی ئەلەکتریك، دەفری شووشەی ماسی تیا بەخێوکردن)

**globefish** (glōb′fish′), *n.* ماسییە خڕە.

**globe-trotter** (glōb′trot′ẽr), *n.* گەڕۆك.

**globin** (glō′bin), *n.* گلۆبین: پرۆتینی ناو " هیمۆگلۆبین " کە ڕەنگی سوور دەدات بە خوێن.

**globoid** (glō′boid), *adj.* نیمچە خڕ.

**globular** (glob′yoo-lẽr), *adj.* خڕ.

**glomerate** (glom′ẽr-it), *adj.* تۆپەڵ؛ تۆپەڵ بوو.

**glomeration** (glom′ẽr-ā′shən), *n.* (١) تۆپەڵ کردن؛ خڕکردن؛ تۆپەڵ بوون. (٢) تۆپەڵ.

**gloom** (glōōm), *v.i.* (١) خەفەتبار بوون؛ دڵتەنگ بوون؛ پەست بوون؛ بەرچاو تاریك بوون. (٢) تاریك بوون؛ ناخۆش بوون.

*v.t.* تاریك کردن؛ ناخۆش کردن.

*n.* (١) تاریکی؛ لێڵی. (٢) شوێنێکی تاریك. (٣) پەستی؛ دڵتەنگی؛ خەفەتباری

**gloominess** (glōōm′i-nis), *n.* (١) تاریکی؛ لێڵی.

(٢) پەستی؛ دڵتەنگی؛ خەفەتباری؛ بەرچاوتاریکی.

(٣) ناخۆشی؛ ناسوودە نەبەخشی.

**gloomy** (glōōm′i), *adj.* (١) تاریك؛ لێڵ.

(٢) پەست؛ دڵتەنگ؛ خەفەتبار؛ بەرچاوتاریك؛ ڕووگرژ: *( a ~ person)*

(۳) ناخۆش، بەستەکەر؛ دڵتەنگکەر. *( a ~ day)*

-gloomily *(adv.)*.

**glorification** (glôr´ə-fi-kā′shən), ***n.*** (۱) نەمری؛ گەورەیی؛ مەزنی؛ مەزن کردن. (۲) [Colloq.]. ئاهەنگ.

**glorify** (glôr′ə-fī´, glō′rə-fī´), ***v.t.*** (۱) نەمرکردن؛ مەزن کردن؛ بەرزکردنەوە؛ گەورەکردن. (۲) پەرستن. *( to ~ God)*

**glorious** (glôr′i-əs, glō′ri-əs), ***adj.*** (۱) شکۆدار، بەشکۆ؛ بەرز؛ سەربەرز؛ زێرین. *( a ~ age)* (۲) زۆر جوان و نایاب (۳) [Colloq.]. زۆر خۆش. *( We had a ~ time.)*

**glory** (glôr′i, glō′ri), ***n.*** (۱) سەربەرزی؛ ناوداری؛ شانازی.
(۲) پەرستن، ستایشی زۆر.
(۳) بەرزی؛ شکۆ؛ کاتی زێرین. *( Greece in her ~ )*
(٤) ئەوپەری خۆشی و شانازی
(٥) جوانی و خۆشی. *( the ~ of the Rocky Mountains)*
(٦) بەهەشت، خۆشی بەهەشتی یا بەهەشتی. (۷) خەرمانە (هونەر).

***v.i.* ( ~ in ),** شانازی پێوەکردن؛ دڵ زۆر پێ خۆش بوون.

**gone to glory,** مردووە

**gloss** (glôs), ***n.*** (۱) بریقە؛ بریسکە. (۲) ڕووکەش (ڕەووشت، دووان).

***v.t.*** (۱) بریقەدارکردن؛ ساف و لووس و بریسکەدار کردن.
(۲) ( ~ over ). کردن بە ژێر لێوەوە (هەڵە، کەموکووری).

***v.i.*** بریقانەوە؛ بریسکانەوە.

**gloss** (glôs), ***n.*** (۱) تێبینی یـ ڕوونکردنەوەی نێوان دێرەکانی پەرتووکێک یا لە قەراغ و پەراوێزەکەیدا (۲) فەرهەنگۆک

***v.t.*** (۱) تێبینی و ڕوونکردنەوە نووسین بۆ پەرتووکێک
(۲) بە هەڵە یـ درۆ لێکدانەوە.

***v.i.*** ڕوونکردنەوەی پەرتووکێک و نووسینەوەی لە پەراوێزەکەیدا.

**glossal** (glos′'l, glôs′'l), ***adj.*** هی زمان؛ تایبەت بە زمان.

**glossary** (glos′ẽr-i, glôs′ẽr-i), ***n.*** فەرهەنگۆک

**-glossarist** *(n.)*.

**glossiness** (glôs′i-nis), ***n.*** بریقە؛ بریسکە؛ ساف و لووس

**glossitis** (glo-sī′tis), ***n.*** هەوکردنی زمان

**glossographer** (glo-sog′rə-fẽr), ***n.*** فەرهەنگۆک نووس؛ نووسەری ڕوونکردنەوەو تێبینی و لێکدانەوە لە پەراوێزی پەرتووکدا.

**glossy** (glôs′i), ***adj.*** (۱) بریقەدار؛ بریقاوە؛ بریسکەدار
(۲) ساف و لووس و بە ڕووکەش جوان

**-glot** (glot), پاشگرێکە بەمانای زانینی چەند زمانێک.
*( polyglot, triglot)*

**glottal** (glot′'l), ***adj.*** گەرووییی (دەنگ، دەنگناسی).

**glottal stop,** دەنگی گەرووداخەر (دەنگناسی).

**glottis** (glot′is), ***n.*** گەروو

**glove** (gluv), ***n.*** (۱) دەستکێش
(۲) دەستکێشی بۆکسباز یا یاریکەری بێسبۆل.

***v.t.*** (۱) دەستکێش لەدەستکردن. (۲) دەستکێش پێدان

**handle with (kid) gloves,** بە ناسکی و لەسەرخۆیی لەگەڵ جووڵانەوە

**put on the gloves,** [Colloq.]. بۆکسبازی کردن

**to throw down the gloves,** نامە ئەرزو نامە گەز کردن (شێربازی)

**to take up the gloves,** قبوڵ کردنی نامە ئەرزو نامە گەز (بەتایبەتی بۆ شێربازی)

**glove compartment,** چەکمەجی ئوتومبێل

**glover** (gluv′ẽr), ***n.*** دەستکێش فرۆش؛ دەستکێش دروستکەر

**glow** (glō), ***v.i.*** (۱) کڵپەکردن. (۲) درەوشانەوە؛ شەوقدانەوە؛ ڕووناکی دانەوە؛ برووسکانەوە؛ گڕلێبوونەوە.
(۳) گەرمایی دانەوە؛ سووتان.
(٤) هەستی گەرم وگوڕ پیشاندان؛ خۆشی و ڕووخۆشی پیشاندان؛ لە تەندرووستی باشدا بوون؛ کەیف قنج بوون.
(٥) (أ) دەم وچاو سووربوونەوە (شەرم، جۆش). (ب) چاو داگیرسان.

***n.*** (۱) شەوق؛ ڕووناکی؛ برووسکە؛ گڕ. (۲) تێری ڕەنگ.
(۳) سووربوونەوەی دەم وچاو لە شەرمدا یا لە خۆشیدا.
(٤) گەرم وگوڕی هەست.
(٥) توندوتیژی.

**glower** (glou′ẽr), ***v.i.*** مۆڕبوونەوە؛ خێسە کردن

***n.*** خێسە؛ مۆڕبوونەوە.

**glowworm** (glō′wũrm´), ***n.*** گوڵە ئەستێرە؛ گوڵ ئەستێرە

**glucose** (glōō′kōs), ***n.*** شەکری میوە

**glue** (glōō), ***n.*** سرێش؛ کەتیرە؛ گەوەن؛ جەوی؛ هێلم.

***v.t.*** بە سرێش پێکەوەلکاندن؛ پێوە نووساندن؛ پێوەلکاندن.

**gluey** (glōō′i), ***adj.*** (۱) سرێشی؛ لینج
(۲) بە سرێش داپۆشراو؛ پڕ لە سرێش؛ سرێشاوی.

**glum** (glum), ***adj.*** پەست؛ خەفەتبار؛ خەمبار؛ ڕووگرژ؛ مرومۆن؛ ڕووترش.

**glume** (glōōm), ***n.*** توێکی دانوێڵە؛ سۆس.

**glut** (glut), ***v.i.*** ئەوسنی کردن؛ زۆر خواردن؛ چنۆکی کردن؛ دەست لە خۆ بەردان

***v.t.*** (۱) ئاخنین؛ زۆر پڕکردن؛ زۆر تێکردن.
(۲) بازاڕ پڕکردن لە فرۆتەنییەک؛ بازار نوقم کردن لە فرۆتەنییەک.

***n.*** (۱) زۆرخۆری؛ زۆر خواردن
(۲) زۆرو زەبەنەیی هەندێ فرۆتەنی لە بازاڕدا؛ زۆروزەبەنەیی.

**glutinous** (glōō′ti-nəs), ***adj.*** لینج.

**glutton** (glut′'n), ***n.*** (۱) کەسێکی زۆرخۆر؛ کەسێکی ئەوسن یا چڵێس
(۲) کەسێکی بەتوانا یا بەکێش (دەربردن، کار).
*( a ~ for work, punishment, etc.)*

**glutton** (glut′'n), ***n.*** گیاندارێکی گۆشتخۆرە لە دەڵەک دەچێت

**gluttonous** (glut′'n-əs), ***adj.*** زۆرخۆر؛ ئەوسن؛ چڵێس؛ چنۆک؛ چاوبرسی

**gluttony** (glut′'n-i), ***adj.*** زۆرخۆری؛ ئەوسنی؛ چڵێسی؛ چنۆکی؛ چاوبرسێتی

**glycerin, glycerine** (glis′ẽr-in, glis′rin), ***n.*** گلیسرین.

**gnarl** (närl), ***n.*** گرێی دار.

***v.t.*** بادان؛ گرێدان؛ کردن بە گرێ

***v.i.*** با خواردن؛ گرێ خواردن؛ پێچ خواردن

**gnarl** (närl), ***v.i.*** مراندن (سەگ)؛ مرەمرکردن

**gnarled** (närld), ***adj.*** گرێیاوی؛ پێچ خواردوو؛ با خواردوو.

**gnarly** (närl′i), ***adj.*** **gnarled.**

**gnash** (nash), ***v.t.*** (۱) ددان جیرکردنەوە؛ ددان لەیەک سوواندن.
(۲) بە ددان کرۆشتن.

***v.i.*** ددان جیرکردنەوە (تووڕەیی، ئازار).

**gnat** (nat), ***n.*** مێشوولە

**gnaw** (nô), ***v.t.*** (۱) بە ددان قرتاندن؛ بە ددان پارچەپارچەکردن.
(۲) بن کەنکردن؛ هەڵکەندن؛ خورانەوە؛ خواردنەوە. *( to ~ a hole)*
(۳) هەراسان کردن؛ چەوساندنەوە؛ پەستکردن؛ بۆڕەکردن.

***v.i.*** (۱) ( ~ at ; ~ away; ~ on )، بن کەنکردن؛ خورانەوە؛ خواردنەوە؛ داوەشاندن. (۲) ( ~ at ; ~ away; ~ on )، چەوساندنەوە؛ هەراسان کردن؛ سەرخستنەسەر؛ پەستکردن؛ بۆڕەکردن

**gnome** (nōm), ***n.*** کورتەبنەیەکی ئەفسانەیی (کە پاسەوانی خەزنەی ژێرزەمین دەکات)

**gnome** (nōm), ***n.*** پەندی پێشینان؛ قسەی نەستەق.

-gnomic *(adj.)*; gnomical *(adj.)*.

**gnomon** (nō′mon), ***n.*** (۱) دەرزی کات پیشاندەری کاتژمێری خۆری
(۲) ئەو لاتەریبەی دەمێنێتەوە پاش لێ برینی لاتەریبێک لە سووچێکی.

-gnomonic *(adj.)*.

**gnosis** (nō′sis), *n.* زانینی ئاینی و گیانی.
**-gnosis** (nō′sis), پاشگرێکە بەمانای: زانین.
**gnostic** (nos′tik), *adj.* بزان؛ زانا (ئاین و بڕوابوون بە خودا).
**Gnosticism** (nos′tə-siz′m), *n.* ڕێبازی دەزانمکاری: بڕوایەکی ئاینی و شۆفێنی و فەلسەفی هەندێ کۆمەڵی خاچ پەرستانی کۆنە.
**GNP, = Gross National Product,** بەرهەمی گشتی میللی.
**gnu** (nōō, nū), *n.* بەرانە کێوییەکی ئەفەریقییە لە گا دەچێت؛ گا کێوی ئەفەریقی
**go** (gō), *v.i.* (١) ڕۆیشتن: ڕۆین: چوون.
(٢) جوولانەوە؛ بزوان. (٣) کارکردن: *( The motor won't ~ . )*
(٤) ئەنجام دان. (٥) پەیڕەوی کردن. (٦) بوون.
(٧) تێپەڕبوون (کات)؛ بەسەرچوون.
(٨) بڵاوبوونەوە *( A rumor went through the office. )*
(٩) ناسراو: *( She ~es by that name. )*
(١٠) لە بارێکدا بوون: *( He ~es in rags. )*
(١١) بوون بە؛ گۆڕان بۆ: *( She went conservative. )*
(١٢) گونجان؛ شیان: *( This hat ~es well with the dress. )*
(١٣) کێشان (زەحمەت، ناخۆشی). *( Please don't ~ to any trouble. )*
(١٤) بەجێهێشتن (شوێن)؛ ڕۆیشتن.
(١٥) بڕۆ؛ دەست پێ بکە (کێ بڕکێ).
(١٦) نەمان؛ دوایی هاتن؛ چوون: *( The pain has gone. )*
(١٧) مردن. (١٨) لابردن؛ نەهێشتن؛ نەمان *( Poverty must ~ . )*
(١٩) شکان
(٢٠) لە کەڵک کەوتن؛ خراپ بوون؛ لە کار کەوتن:
*( His eyesight will ~ first. )*
(٢١) دەست لێ هەڵگرتن *( The country house must ~ . )*
(٢٢) پێدان؛ دران بە (خەڵات) *( The prize ~es to Jean. )*
(٢٣) فرۆشتن بە؛ دان بە: *( The painting went for fifty dollars. )*
(٢٤) لاچۆ!؛ لاچۆ لەبەرچاوم!؛ بڕۆ.
(٢٥) هاتوچۆکردنی ڕێکوپێک؛ چوون: *( This bus ~es to Los Angeles. )*
(٢٦) گەیشتن؛ بڕکردن: *( The belt won't ~ around his waist. )*
(٢٧) چوون (ڕێگە)؛ ڕۆیشتن: *( This road ~es to London. )*
(٢٨) چوون (بۆکار، خوێندن) *( He ~es to college. )*
(٢٩) سکاڵاکردن لە لا؛ چوونە لا؛ پەنابردنە بەر
*( You must ~ to the president. )*
(٣٠) کردن *( Do you think they will ~ to war? )*
(٣١) ڕادەی کردن *( How far did he ~ in his protests? )*
(٣٢) دەربردن؛ هەڵکردن
(٣٣) دەخرێنە؛ دادەنرێت: *( The shirts ~ in the second drawer. )*
*v.t.* (١) گرەوکردن. (٢) [Slang]، دەربردن؛ هەڵکردن.
*n.* (١) ڕۆیشتن؛ چوون. (٢) سەرگرتن؛ سەرکەوتن؛ بە باشی کارکردن.
(٣) [Colloq.]، ورزە؛ تین. (٤) [Colloq.]، بار؛ دۆخ.
(٥) [Colloq.]، ( the ~ )، مۆدە؛ باو. (٦) [Colloq.]، ڕێکەوتن.
(٧) [Colloq.]، هەوڵدان؛ تەقەلا.
**as people ( or things ) go,** لەچاو خەڵک یا شتی تردا.
**go about,** (١) خەریک بوون؛ کردن. (٢) گەڕان. (٣) بڵاوبوونەوە.
(٤) ئاراستە گۆڕین (کەشتی).
**go after,** [Colloq.], هەوڵ بۆ دان؛ دواکەوتن (بۆ دەستکەوتن).
**go against,** دژ وەستان؛ دژ بوون؛ بەرەنگاری کردن.
**go along,** (١) بەردەوام بوون. (٢) قایل بوون؛ پەسەندکردن؛ هاوکاری کردن؛ گونجان. (٣) ( ~ with )، لەگەڵ چوون.
**go around,** (١) دەورەدان. (٢) پێچ کردنەوە. (٣) بەش کردن.
(٤) گەڕان. (٥) بڵاوبوونەوە.
**go at,** (١) هێرش بردنەسەر؛ پەلاماردان.
(٢) کار لەسەر کردن؛ بە تینەوە خەریک بوون.
**go back on,** [Colloq.], (١) ناپاکی کردن؛ بێ وەفایی کردن.
(٢) پەشیمان بوونەوە؛ پاشگەزبوونەوە؛ گفت شکاندن.
**go beyond,** تێپەڕبوون؛ زیاتر بوون لە
**go by,** (١) تێپەڕبوون بە لادا. (٢) تێپەڕبوون (کات)؛ بەسەرچوون.
(٣) سەرلێدان. (٤) گوێ پێ نەدان.
(٥) لەسەر ڕۆیشتن (پەیڕەو).
(٦) بە ناوێک ناسران: *( to go by a name )*.
**go down,** (١) نزم بوونەوە؛ هاتنەخوارەوە. (٢) نوقم بوون.
(٣) ئاوابوون (خۆر). (٤) دۆڕانن؛ شکان.
(٥) هەتا هەتا بوون لە مێژوودا
*( to go down in history as a great leader )*
**go for,** (١) وا دانران. (٢) هەوڵ بۆ دان. (٣) لایەنگری کردن.
(٤) [Colloq.]، پەلاماردان.
(٥) [Slang]، بە دڵ بوون؛ ویستن؛ حەزلێکردن.
**go hard with,** تووشی ناخۆشی کردن؛ سەرئێشە تووش کردن.
**go in for,** [Colloq.], (١) تێدا بەشداربوون.
(٢) ویستن؛ بە دڵ بوون؛ حەزلێکردن.
**go into,** (١) لێکۆڵینەوە. (٢) کردن بە پیشەی خۆ؛ خەریک بوون (کاروبار)
(٣) تێدابوون.
**go in with,** بەشداربوون (ئەرک، خەرجی... هتد).
**go off,** (١) ڕۆیشتن؛ ڕۆین؛ بەجێهێشتن (جێگە).
(٢) تەقین؛ تەقینەوە: *( The bomb will go off at 9:00 A.M. )*
(٣) ڕوودان؛ هاتنەدی.
**go on,** (١) بەردەوام بوون؛ لەسەر ڕۆیشتن. (٢) ڕوودان.
(٣) [Colloq.]، چەقەچەق کردن. (٤) ڕەفتارکردن.
(٥) دەرکەوتن لەسەر شانۆ؛ هاتنەسەر شانۆ.
**go ( a person ) one better,** [Colloq.], باشتربوون لە؛ لێ بردنەوە
**go out,** (١) کوژانەوە (ئاگر، گڵۆپ، چرا). (٢) مۆدە نەمان.
(٣) چوونەدەرەوە (بۆ سینەما، ئاهەنگ، گەڕان)
(٤) هاوسۆزی کردن. (٥) مانگرتن.
**go over,** (١) لێ وردبوونەوە؛ بە وردی لێکۆڵینەوە.
(٢) دووبارەکردنەوە؛ سەرلەنوێ کردنەوە
(٣) پیاچوونەوە (باس، نووسراو، مەسەلە).
(٤) [Colloq.]: سەرکەوتوو بوون؛ سەرکەوتن؛ بە دڵی خەڵک بوون
*( Did his speech go over well? )*
**go through,** (١) بە تەواوی و وردی کردن یا بەجێهێنان.
(٢) چەشتن (ناخۆشی). (٣) پشکنین؛ گەڕان؛ پیاگەڕان.
(٤) پەسەندکران؛ مۆرکران.
(٥) خەرج کردن؛ بەکارهێنان؛ تەواوکردن؛ هیچ نەهێشتنەوە:
*( He goes through two packs of cigarrettes a day. )*
**go through with,** تەواوکردن؛ واز لێ نەهێنان هەتا دوایی.
**go to!** [Archaic], تەواوە! (بە تەوسەوە)؛ ڕاستە (بە تەوسەوە).
**go together,** (١) پێکەوە گونجان؛ لە یەک هاتن.
(٢) [Colloq.]، یاری یەکتر بوون؛ دڵدار یا دۆستی یەکتر بوون.
**go under,** (١) نوقوم بوون.
(٢) شکستی هێنان؛ نوشوستی هێنان؛ ژێرکەوتن.
**go up,** (١) بەرزبوونەوە. (٢) نرخ زیادبوون.
(٣) نرخ زیادکردن؛ بە بایەخ بوون.
**go with,** (١) لەگەڵ بوون؛ لەگەڵدا چوون یا ڕۆیشتن.
(٢) لەگەڵ گونجان؛ لە یەک هاتن
(٣) [Colloq.]، دڵدار یا یاری یەکتر بوون: *( He is going with her. )*
**go without,** هەڵکردن یا دەربردن بەبێ شتێک.
**have a go at,** [Colloq.], هەوڵدان.
**let go,** (١) بەرەڵاکردن؛ ڕزگارکردن؛ بەردان.
(٢) دەست لێ بەردان؛ دەستبەرداربوون.

(۲) وار لێ هێنان؛ دەست لێ هەڵگرتن

**let oneself go,** بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن؛ جڵەو بۆ خۆ شل کردن

**no go,** [Colloq.]. نابێ!؛ بێ کەڵکە؛ بێ سوودە

**on the go,** [Colloq.]. هەمیشە لە جموجووڵدایە؛ هەمیشە خەریکە

**to go,** [Slang]. دەبرێتە دەرەوەو دەخورێت (خواردەمەنی چێشتخانەیەك).

**goad** (gōd), *n.* (۱) نەقیزە (۲) ناوزەنگی؛ هاندەر.

*v.t.* نەقیزە تێوەژەندن؛ هاندان؛ پاڵ پێوەنان.

**go-ahead** (gō′ə-hed′), *adj.* (۱) بۆ پێشەوە چوو.

(۲) [Colloq.]. ئیشکەر؛ بە تین‌و جۆش.

*n.* ( **the ~** ), ڕێگەپێدان.

**goal** (gōl), *n.* (۱) ئامانج؛ ئاوات

(۲) (أ) گۆڵ (یاری تۆپی پێ) (ب) گۆڵ کردن. (ج) گۆڵچی.

**goalie** (gōl′i), *n.* [Colloq.], = **goalkeeper.**

**goalkeeper** (gōl′kēp′ēr), *n.* گۆڵچی

**goat** (gōt), *n.* (۱) بزن (۲) پیاوێکی چاوباز؛ چاوباشقاڵ؛ پیاوێکی زۆر بە هەوەس (جووت بوون) (۳) [Slang]. قوربانی.

**get one's goat,** [Slang]. پەستکردن؛ توورەکردن؛ ڕق هەڵساندن.

**goatee** (gō-tē′), *n.* چەناگە ڕیش

**goatherd** (gōt′hûrd′), *n.* شوانی بزن؛ بزن

**goatish** (gōt′ish), *adj.* (۱) بزنانە؛ بزنی؛ تایبەتی بە بزن.

(۲) چاوباز؛ چاوباشقاڵ؛ حەزکەر بە جووت بوون.

**goatskin** (gōt′skin′), *n.* (۱) پێستەی بزن (۲) قایشی بزنە پێستە. (۳) مەشکە

**gobble** (gob′'l), *n.* عەلوعولوری نێرە قەلەموون.

*v.i.* عەلوعوولوکردن (نێرە قەلەموون).

**gobble** (gob′'l), *v.t. & v.i.* (۱) ماشتنەوە (خواردن)؛ لووشدان؛ بە پەلەو چاوبرسی‌یانە خواردن. (۲) [Slang]. دەست بەسەردا گرتن؛ داگیرکردن

**gobbledygook** (gob′'l-di-gook′), *n.* [Slang]. دروازو نووسینی پڕ لە ووشەی زل‌و نادیارو مانا بەدەستەوەنەدەر.

**gobbler** (gob′lēr), *n.* نێرە قەل

**go-between** (gō′bi-twēn′), *n.* دەلال؛ ناوبژیکەر

**goblet** (gob′lit), *n.* (۱) کاسە یا دەفری ئاو خواردنەوە (۲) پەرداخی لاسکدار

**goblin** (gob′lin), *n.* جنۆکە؛ دەعبا؛ دێوودرنج

**go-cart** (gō′kärt′), *n.* (۱) ڕەوڕەوەی پێگرتنی منداڵ (۲) عەردەبانەی منداڵ (۳) عەرەبانەی بچووك

**god** (god), *n.* (۱) خودای بچووك؛ خودا؛ گچکە خوا (۲) بت؛ شتی پەرستراو (۳) کەسێکی پەرستراو (٤) [G-]. خودا؛ خوا؛ یەزدان؛ پەروەردگار

**God willing,** خوا بکات؛ پەنا بە خوا.

**god-child** (god′child′), *n.* منداڵی گیانی. منداڵێك کە لەکاتی کردن بە خاچ پەرستیدا دەبێتە منداڵی گیانی برادەرێکی نزیك دایك‌و باوکەکەی.

**goddamned, goddamn** (god′damd′), *adj.* بە لەعنەت بێت!؛ لەعنەتی خوای لێ بێت

**god-daughter** (god′dô′tēr), *n.* کچی گیانی. ووشەی پێشوو ببینە.

**goddess** (god′is), *n.* (۱) بانووخوا؛ خواژن (۲) ئافرەتێکی زۆر جوان یا ڕەووشت چاك.

**godfather** (god′fä*th*ēr), *n.* باوکی گیانی

**God-fearing** (god′fēr′iŋ), *adj.* (۱) لە خودا ترس. (۲) خوداناس؛ ئاینداز؛ زۆر بە ئاین

**God-forsaken** (god′fēr-sā′kən), *adj.* (۱) بەد؛ ناپەسەند؛ ڕەووشت پیس (۲) [Colloq.]. چۆڵ‌و ناخۆش

**godhead** (god′hed), *n.* (۱) خودایەتی؛ خودایی. (۲) [G-]. خودا؛ یەزدان.

**godhood** (god′hood), *n.* خودایەتی؛ خودایی.

**godless** (god′lis), *adj.* خودانەناس؛ کافر؛ بێ ئاین.

**godlike** (god′līk′), *adj.* خودا ئاسا؛ لە خودا چوو؛ پیرۆز.

**godliness** (god′li-nis), *n.* خودا پەرستن؛ خوداپەرستی؛ بە ئاینی؛ خودایەتی.

**godling** (god′liŋ), *n.* خودای بچووك.

**godly** (god′li), *adj.* (۱) [Archaic]. خودایی؛ پیرۆز. (۲) زۆر بە ئاین؛ خوداناس.

**godmother** (god′mu*th*′ēr), *n.* دایکی گیانی.

**godparent** (god′pâr′ənt), *n.* دایك یا باوکی گیانی.

**godsend** (god′send′), *n.* دەسکەوتێك یا خۆشی‌یەکی چاوەڕوان نەکراوی وەك لە خوداوە نێردراو.

**godson** (god′sun′), *n.* کوڕی گیانی.

**Godspeed** (god′spēd′), *n.* خودا ئاگای لێت بێت‌و سەرکەوتوو بیت؛ دۆعای گەشت خۆشی.

**godwit** (god′wit), *n.* باڵندەیەکی بچووکی دەنووك درێژە لە ڕۆخی دەریادا دەژی.

**go-getter** (gō′get′ēr), *n.* [Slang]. کەسێکی بە هەڵپە، بە چنگ، یا بە هەڵمەت.

**goggle** (gog′'l), *v.i.* (۱) چاو زەق کردنەوە. (۲) چاو بادان؛ چاو پێچ پێدان.

*n.* (۱) (أ) چاوزەقی؛ چاو زەق کردنەوە. (ب) چاو بادان. (۲) (*pl.*) چاویلکەی پاراستن (کە قەراغی چاو دادەپۆشێت بۆ پاراستنی لە تەپ‌وتۆزو با، هەروەها لە ئاو لە کاتی مەلەکردن یا چوونە ژێر ئاودا)؛ چاویلکەی ژێر ئاو.

*adj.* زەق (چاو)؛ چاو زەق.

**goggle-eyed** (gog′'l-id′), *adj.* چاو زەق.

**going** (gō′iŋ), *n.* (۱) ڕۆیشتن؛ بەجێهێشتن؛ چوون (۲) چۆنێتی ڕێگاوبان. (۳) [Colloq.]. باری ڕۆژ یا کاروبار.

*adj.* (۱) کار دەکات؛ لە گەڕدایە. (۲) هی ئێستا: *( The ~ rates are low.)* (۳) هەیە؛ دەست دەکەوێت: *( the best products ~ )*.

**be going to,** نیازبوون (کردنی کارێك): *( I am going to write him a letter today or tomorrow.)*

**get going,** [Colloq.]. دەستپێکردن.

**going on,** [Colloq.]. ڕەووشت یا کردەوە (بەتایبەتی هی ناپەسەند)؛ ڕووداوی ناپەسەند.

**gold** (gōld), *n.* (۱) زێڕ؛ زەڕ؛ ئاڵتوون. (۲) پارەی زێڕ. (۳) سامان؛ پارە. (٤) زەردی ئاڵتوونی؛ ڕەنگی زەردی وەك زێڕ. (٥) شتێکی نایاب‌و بەنرخ: *( His voice is pure ~ .)*

*adj.* (۱) زێڕ؛ لە زێڕ دروستکراو *( a ~ watch)*. (۲) زەرد. (۳) پاڵپشتی کراوە بە زێڕ.

**gold-digger,** [Slang]. (۱) ئافرەتێك کە چاوەڕێی دیاری گران‌و پارە دەکات لە دۆستەکانی. (۲) شوێن زێڕ کەوتوو؛ بۆ زێڕ گەڕاو.

**golden** (gōl′d'n), *adj.* (۱) زێڕ؛ زێڕین؛ ئاڵتوون (۲) زەرد. (۳) زۆر بەنرخ: *( a ~ opportunity)*. (٤) زێڕین (کات)؛ خۆش‌و پێشکەوتوو: *( ~ age)*.

**golden age,** چەرخی زێڕین.

**golden goose,** قازی هێلکە زێڕین (ئەفسانەی یۆنانی).

**golden rule,** (۱) ڕێبازی زێڕین: بریتی‌یە لە پێویستی جووڵانەوە لەگەڵ خەڵکدا بەو جۆرەی کە دەتەوێت لەگەڵتدا بجووڵێنەوە. (۲) ڕێبازی چاك

**gold-finch** (gōld′finch′), *n.* حەوت ڕەنگیلە: باڵندەیەکی بچووکی باڵ زەردە.

**gold-fish** (gōld′fish′), *n.* ماسی‌یه زەردە. ماسی‌یەکی ڕەنگ زێڕی‌یە
لە ناوماڵدا بۆ جوانی بەخێودەکرێت
**gold mine,** (١) کانە زێڕ؛ کانە ئاڵتوون.
(٢) [Colloq.]. سەرچاوەی شتێکی زۆر بەنرخ و بەسوود.
**gold plate,** قاپی زێڕ
**gold rush,** بە پەلە چوونی خەڵك بۆ شوێنێك کە زێڕی تێدا دۆزراوەتەوە.
**goldsmith** (gōld′smith′), *n.* زەڕەنگەر؛ ئاڵتوونچی
**gold standard,** سیستەمی زێڕ (دارایی).
**golf** (gôlf, golf), *n.* یاری گوڵف
*v.i.* یاری گۆڵف کردن.
**golf club,** (١) داری گۆڵف. (٢) یانەی گۆڵف
**golf course,** یاریگای گۆڵف.
**golly** (gol′i), *interj.* ئەی هەو، بە ماڵم!
**gonad** (gon′ad, gō′nad), *n.* لووی زاووزێ؛ ڕژێنی جووت بوون یا
زاووزێ، کە گون و هێلکەدان دەگرێتەوە؛
**gondola** (gon′də-lə), *n.* (١) گوندوڵە، بەلەمی شاری ڤینیسیا
(٢) فارگونێکی بێ سەری بار.
(٣) زووری ژێر باڵۆن (بۆ مەکینە و خەڵکەکە)
**gondolier** (gon′də-lêr′), *n.* گوندوڵەوان؛ بەلەمەوان.
**gone** (gôn, gon), *past participle of* go.
*adj.* (١) ڕۆیشتوو؛ ڕۆیو (٢) فەوتاو؛ بەکەڵك نەماو؛ بەکار نەماو؛ وێران بوو.
(٣) مردوو؛ لە مردندایە؛ بەرەو نەمان دەچێت (٤) کز؛ بێ هێز.
(٥) هیچی نەماوە؛ هەمووی بەکارهێنراوە؛ تەواوبووە.
(٦) ئەکیس جوو، نەماو (٧) ڕابوردوو.
**goner** (gôn′ēr, gon′ēr), *n.* [Colloq.]. کەسێك کە لە سەرەمەرگدا
بێت؛ کەسێك یا شتێك کە فەوتانی نزیك بێت؛ کەسێك یا شتێك کە هیوای هیچی
لێ نەکرێت
**gong** (gôŋ, goŋ), *n.* زەنگی حەپلەیی. حەپلەیەکی ئەختێك قوقزی
ئاسنینە دەنگ دەداتەوە کە شتێکی پیا دەماڵرێت (وەك زەنگ بەکاردەهێنرێت
بۆ ووریاکردنەوەی خەڵك)
**goniometer** (gō′ni-om′ə-tēr), *n.* گۆشەپێو (ئامێر)
-**goniometry** *(n.).*
**gonorrhea, gonorrhoea** (gon′ə-rē′ə), *n.* سووزەنەك
**goo** (goo), *n.* [Slang]. (١) شتێکی لینج (وەك سرێش).
(٢) شتێکی لینج و شیرین
**good** (good), *adj.* (١) باش، چاك، خاس؛ نایاب.
(٢) تازە، باش *( ~ eggs)*
(٣) ڕاستەقینە *( ~ money)*
(٤) باش، تەندرووست؛ بەهێز *( ~ eyesight)*
(٥) پەسەند: چاك؛ باش: *( one's ~ name)*
(٦) خۆش: *( Life is ~ here.)* .
(٧) پشت پێ بەستراو؛ باش *( ~ advice)*
(٨) وورد؛ چاك: *( a ~ job of cleaning up)* .
(٩) خۆش؛ زۆر و بەتام: *( a ~ meal)* .
(١٠) (أ) داوێن پاك؛ پاك. (ب) لە خوا ترس
(ج) بە ڕەحم؛ هاوسۆز. (د) ڕەووشت چاك.
(هـ) جوان (ڕەووشت) *( ~ manners)* .
(١١) لێهاتوو؛ بەتوانا؛ بە بەهرە: *( a ~ swimmer)*
(١٢) زۆر؛ فرە *( a ~ many)* .
*n.* (١) باشی؛ چاکی؛ باشێتی. *( There is much ~ in him.)* .
(٢) کەڵك؛ سوود؛ قازانج. (٣) شتێکی باش
*interj.* دەست خۆش!؛ باشە!؛ زۆر باشە!؛ ئافەرین!
*adv.* بە باشی، بە تەواوی.
**as good as,** نزیکەی، وەك ئەوە وایە.
**come to no good,** بە هیچ نەبوون؛ ئەنجامی باش نەبوون؛ تێکشکان.

for good, هەتا هەتا؛ بە یەکجاری؛ بە ئێجگاری.
good and, [Colloq.]. (١) زۆر. (٢) بەتەواوی؛ هەمووی.
make good, (١) بۆ ژماردن؛ بۆ گۆڕینەوە
(٢) کردن؛ جێبەجێ کردن؛ بەجێهێنان. (٣) هێنانەدی.
(٤) سەرکەوتن. (٥) سەلماندن.
no good, بێ فەڕ؛ بێ سوود؛ بێ کەڵك؛ قەڵب.
the good, (١) پیاوچاکان. (٢) کاری چاکە؛ کاری پاك‌وچاك.
**good afternoon,** پاش نیوەڕۆت باش (سڵاوکردن یا خواحافیزی).
**good-by, good-bye** (good′bī′), *interj. & n.* خوداحافیز؛
خوات لەگەڵ.
**good day,** ڕۆژباش؛ خوداحافیز.
**good deal,** (١) ژمارەیەکی زۆر؛ زۆر. (٢) [Slang]، زۆر باش.
**good evening,** ئێوارەت باش (سڵاوکردن یا خواحافیزی)؛
ئێوارەتان باش.
**good fellow,** کوڕی باش؛ پیاوی چاك.
**goodfellowship** (good′fel′ō-ship′), *n.* برادەرایەتی؛
دۆستایەتی.
**good-for-nothing** (good′fēr-nuth′iŋ), *adj.* بێ فەڕ؛ بێکارە؛
قەڵب؛ نالەبار؛ بێ سوود.
*n.* کەسێکی بێ فەڕ، نالەبار، بێکارە یا قەڵب.
**Good Friday,** هەینیی پیرۆز؛ هەینیی مەزن: یادی ڕۆژی هەڵواسینی
عیسا (کە سێ ڕۆژ پێش جەژنی زیندووبوونەوەیەتی).
**good-hearted** (good′här′tid), *adj.* دڵ باش؛ بەڕەحم؛
باش (مرۆڤ).
**good-humored** (good′hū′mērd), *adj.* ڕووخۆش.
**good-looking** (good′look′iŋ), *adj.* جوان (مرۆڤ)؛ قۆز؛ شۆخ؛
ئێسك سووك.
**good looks,** ئێسك سووکی؛ جوانی (مرۆڤ)؛ قۆزی.
**goodly** (good′li), *adj.* (١) ئێسك سووك؛ جوان؛ قۆز.
(٢) باش؛ چاك. (٣) زۆر؛ فرە؛ زەبەنە.
-goodliness *(n.).*
**good morning,** بەیانیت باش (سڵاوکردن یا خواحافیزی)؛
بەیانیتان باش.
**good-natured** (good′nā′chērd), *adj.* ڕەووشت چاك؛
سرووشت باش؛ لەبار؛ هێمن؛ ڕووخۆش.
**goodness** (good′nis), *n.* (١) باشی؛ چاکی؛ پاکی؛ پیاوچاکی؛
بەڕەحمی. (٢) ناوکرۆك؛ پوختە.
*interj.* بۆ خاتری خودا!: *( for ~ sake!)* .
**good night,** شەوباش (خوداحافیزی یا نووستن).
**goods** (goodz), *n.pl.* (١) شتومەك؛ شت؛ کەلوپەل.
(٢) فرۆتەنی. (٣) قوماش؛ کووتاڵ. (٤) [British]، بار.
**deliver the goods,** کردن یا بەجێهێنانی ئەوەی پێویستە؛
بەڵێن نەشکاندن؛ بەڵێن بەجێهێنان.
**get ( or have ) the goods on,** [Slang], دۆزینەوە یا زانینی تاوانێك
لەسەر کەسێك یا دەستەیەك.
**good speed,** خوا ئاگای لێت بێت و سەرکەوتوو بیت؛
دۆعای گەشت خۆشی.
**good-tempered** (good′tem′pērd), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛
زوو تووڕە نەبوو.
**good turn,** چاکە؛ پیاوەتی؛ چاکەکردن.
**good will,** (١) هەستی برادەرانە و پاك بەرامبەر بە خەڵك؛
چاکەی خەڵك ویستن. (٢) ئامادەیی بۆ قایل بوون و پەسەندکردن
(٣) ناوبانگی باشی دەزگایەکی بازرگانی.
**goody** (good′i), *n.* (١) *(pl.)* خواردنێکی شیرین و خۆش (وەك نوقول).
(٢) کەسێکی بە سەرزاری پاك‌و بە ئاین.

***interj.*** ووتەی دەربڕینی هەستی خۆشی و شادی منداڵ.
**goody** (good′i), ***n.*** پیرێژنێکی فەقیر.
**goody-goody** (good′i-good′i), ***adj.*** بە سەرزاری و لە ڕادە بەدەر ڕووخۆش و باش و هاوسۆز.
**gooey** (gōō′i), ***adj.*** [Slang]. (١) لینج (وەك سریش)؛ لیقن. (٢) لینج و شیرین.
**goof** (gōōf), ***n.*** [Slang]. (١) کەسێکی ساویلکە و بێ مێشك و ناکارامە (٢) هەڵەیەکی بچووك
***v.i.*** [Slang], هەڵەکردن؛ بەهەڵەداچوون؛ لە پیلکە دەرچوون؛ ژێرکەوتن.
**goofy** (gōōf′i), ***adj.*** [Slang]. منداڵانە؛ کەرانە؛ کەر؛ ناکارامە: ***( a ~ person, hat, etc.)***
**-goofily** ***(adv.)***; **goofiness** ***(n.)***.
**gook** (gook, gōōk), ***n.*** [Military Slang]. کەسێکی فیلیپینی. یابانی، یا کوریایی (لەڕووی سووکی‌یەوە).
**goon** (gōōn), ***n.*** [Slang]. (١) کەسێکی ناقۆڵا و گەمژە و قەڵب (٢) شەلاتی (بەتایبەتی هی بەکرێ گیراو بۆ تێکشکاندنی مانگرتنێك).
**goosander** (gōōs-an′dēr), ***n.*** مراوی‌یەکی ماسی خۆرە.
**goose** (gōōs), ***n.*** (١) قاز. (٢) گۆشتی قاز. (٣) کەسێکی هیچ‌وپووچ و بێ مێشك و ساویلکە. (٤) جۆرە ئوتوبەکە. (٥) [Slang]. سیخوڕمە (لەڕووی یاری‌یەوە).
***v.t.*** [Slang], (١) سیخوڕمە تێوەژەندن (لەڕووی یاری‌یەوە). (٢) بەنزین کردنە مەکینەوە بە قلپە قلپ
**cook one's goose**, [Colloq.], نانی خۆ بڕین؛ هەل لەدەست خۆ دان و کاری خۆتێکدان
**goose bumps**, موورگرژی؛ موورچرکە (بەتایبەتی کە دەبێتە هۆی دەرپۆقینی کونیلەکانی پێست).
**goose flesh**, = goose bumps.
**goose pimples**, = goose bumps.
**goose step**, ڕۆیشتنی تایبەتی سەرباز
**gopher** (gō′fēr), ***n.*** ئەرزهەڵکەنە؛ گۆڕهەڵکەنە؛ جرج
**gore** (gôr, gōr), ***n.*** خوێن (بەتایبەتی هی مەیبو)؛ خوێنی ڕژاو.
**gore** (gôr, gōr), ***v.t.*** بریندارکردن بە شاخ یا شفرە.
**gore** (gôr, gōr), ***n.*** (١) پارچە زەوی‌یەکی بچووکی سێگۆشە. (٢) پارچەیەك قوماشی سێگۆشەیی کە پانی دەنوێنێت لە کردنەوەدا (چەتر، تەنوورە، بایەوانی کەشتی)
**gorge** (gôrj), ***n.*** (١) قوڕگ. (٢) ئەوسنی؛ چڵێسی. (٣) زۆرخۆری؛ زۆر خواردن (٤) خواردنی ماشینراوە یا خوراو. (٥) قین؛ قێزهاتنەوە؛ ڕق. (٦) دەرگای پشتەوەی قەڵایەك. (٧) گەلی؛ دەربەند. (٨) کۆسپ یا تۆپەڵێکی گەورە کە ڕێگایەك بگرێت.
***v.i.*** زۆر خواردن و بە پەلە؛ لووشدان؛ ماشینەوە.
***v.t.*** (١) پڕکردن (لە خواردن)؛ تێ تران (٢) بە ئەوسنانە خواردن یا قووتدان.
**make one's gorge rise**, دڵ تێکەڵهاتن؛ تووڕەبوون؛ ڕق هەڵسان.
**gorgeous** (gôr′jəs), ***adj.*** (١) ڕەنگاوڕەنگ؛ گەش؛ جوان؛ ڕازاوە (٢) [Slang]: جوان؛ نازدار؛ زۆر جوان (٣) [Slang] خۆش
**gorilla** (gə-ril′ə), ***n.*** (١) گۆریلا گەورەترین مەیموونی ئەفەریقایی‌یە لە ئادەمیزاد دەچێت (٢) [Slang]. (ا) کەسێکی ناشرینی بەهێزی وەك مەیموون (ب) شەلاتی
**gory** (gôr′i, gō′ri), ***adj.*** (١) خوێناوی؛ بە خوێن داپۆشراو. (٢) خوێناوی؛ پڕ لە خوێن ڕشتن ***( a ~ battle, story, etc.)***.
**-gorily** ***(adv.)***; **goriness** ***(n.)***.
**gosh** (gosh), ***interj.*** هاوار بە ماڵم!
**goshawk** (gos′hôk′, gôs′hôk′), ***n.*** شاباز؛ باز

**gosling** (goz′liŋ), ***n.*** بەچکە قاز.
**gospel** (gos′p'l), ***n.*** (١) مێژووی ژیانی مەسیح و ئامۆژگاری‌یەکانی. (٢) [G-]، یەکێك لە یەکەم چوار بەشی ئینجیل؛ ئینجیل. (٣) [G-]، هەڵبژاردەیەکی ئینجیل کە لە نوێژی کۆمەڵدا دەخوێنرێتەوە. (٤) ڕێباز و ئامۆژگاری پەسەندکراو و بە ڕاست دانراو.
**gossamer** (gos′ə-mēr), ***n.*** (١) پەردەیەکی تەنکە لە هەوادا و بەسەر ڕووەك و درەختەوە وەك هێلانەی جاڵجاڵۆکە. (٢) قوماشێکی زۆر تەنك؛ کرێشە (٣) شتێکی تەنك و ناسك.
***adj.*** تەنك و سووك و پەردەیی.
**-gossamery** ***(adj.)***.
**gossip** (gos′əp), ***n.*** (١) [Obs. or Dial.]، (ا) باوك و دایکی گیانی. ب) برادەری گیانی بە گیانی (٢) کەسێکی بەدگۆ، پاش دوو، فیتنەباز، غەیبەتکەر، یا لە پاش ملە دوو. (٣) بەدگۆیی؛ لە پاش ملە دوویی؛ ووت‌ووات؛ غەیبەت کردن؛ فیتنەبازی.
***v.i.*** بەدگۆیی کردن؛ ووت‌ووات کردن؛ غەیبەت کردن؛ فیتنەبازی کردن؛ لە پاش ملە دووان.
**gossipry** (gos′əp-ri), ***n.*** [Rare], (١) ووت‌ووات؛ لە پاش ملە دووان؛ غەیبەتکاری. (٢) پاش دووان؛ غەیبەتکاران؛ ووت‌ووات کەران.
**gossipy** (gos′ə-pi), ***adj.*** (١) حەزکەر لە ووت‌ووات، پاش دوویی، یا غەیبەت. (٢) پڕ لە ووت‌ووات و لە پاش ملە دووان.
**got** (got), *past tense and alternative p p. of* **get.**
**Goth** (goth, gôth), ***n.*** (١) گۆتی: یەکێك لە خێڵێکی ئەڵمانی کۆن کە زۆربەی ئیمپراتۆری‌یەتی ڕۆمانی داگیرکرد لە سەدەی سێیەم و چوارەم و پێنجەمی زاینیدا. (٢) کەسێکی گەوج و کێوی.
**Gothic** (goth′ik), ***adj.*** (١) گۆتی؛ تایبەتی بە گۆتی‌یەکان و زمانەکەیان (٢) تایبەتی بە هونەری خانووسازی گۆتی کە بریتی‌یە لە تاق و هێڵ و ئەمیچ و گوێ سەبانەی نووك تیژ.
***n.*** (١) زمانی گۆتی‌یەکان. (٢) هونەری خانووسازی گۆتی.
**Gothic arch**, تاقی نووك تیژ (خانووسازی)
**gouge** (gouj), ***n.*** (١) ئەسکەنە. (٢) [Colloq.]، (ا) درز یا کون تێکردن بە ئەسکەنە. (ب) درز؛ کون. (٣) [Colloq.]، (ا) ساختەکردن؛ فریودان؛ هەڵخەڵەتاندن. (ب) ساختەچی
***v.t.*** (١) درز یا کون تێکردن بە ئەسکەنە. (٢) هەڵکۆڵین؛ هەڵکەندن؛ چاو هەڵکۆڵین: ***( His eye was ~d out.)***. (٣) [Colloq.]، ساختەلێکردن؛ هەڵخەڵەتاندن.
**goulash** (gōō′läsh, gōō′lash), ***n.*** شلەی گۆشت و سەوزە.
**gourd** (gôrd, gōrd, goord), ***n.*** (١) کوولەکەی ملدار؛ کوولەکە- دەروێشی؛ کوولەکەی ڕازاندنەوە: جۆرە کوولەکەیە کە ناوەکەی هەڵدەکۆڵرێت و ووشك دەکرێتەوە بۆ شت تێکردن یا تیا خواردنەوە. (٢) ڕووەکی تەرزفڕێندەر (کوولەکە، خەیار، کاڵەك، شووتی).
**gourmand** (goor′mənd), ***n.*** (١) کەسێکی زۆرخۆر و ئەوسن. (٢) خواردنناس؛ وەستای خواردن.
**gourmet** (goor′mā), ***n.*** خواردنناس؛ وەستای خواردن؛ حەزکەر لە خواردنی خۆش و نایاب.
**gout** (gout), ***n.*** (١) باداری (نەخۆشی). (٢) دڵۆپە خوێن.
**gouty** (gout′i), ***adj.*** (١) تایبەتی بە باداری (٢) وەك باداری؛ دەبێتە هۆی باداری (٣) بادار.
**-goutiness** ***(n.)***.
**govern** (guv′ērn), ***v.t.*** (١) ڕاندن؛ ڕانین؛ بەڕێوەبردن؛ حوکم کردن؛ فەرمانڕەوایی کردن. (٢) دابینکردن؛ ڕاگیرکردن؛ گرتن؛ ڕاگرتن. (٣) ڕێك‌وپێك کردنی خێرایی (ئوتومبیل). (٤) بڕیاردان؛ گرتنەوە و پەیوەندی پێوە بوون: ***( The scientific principles ~ing a phenomenon)*** (٥) پێویست بوونی شێوەیەکی تایبەتی ووشە (زمانەوانی).
***v.i.*** ڕاندن؛ بەڕێوەبردن؛ حوکم کردن؛ فەرمانڕەوایی کردن.

**governable** (guv′ĕrn-ə-b'l), *adj.* بەڕێوەدەبرێت؛ دانین دەکرێت؛
فەرمانڕەوایی دەکرێت

**governance** (guv′ĕr-nəns), *n.* بەڕێوەبردن؛ ڕ ندن؛
فەرمانڕەوایی کردن

**governess** (guv′ĕr-nis), *n.* (١) پەروەردەکاری منداڵی ماڵێک (ژن)
(٢) [Rare] فەرمانڕەوا (ژن).

**government** (guv′ĕr-mənt, guv′ĕrn-mənt), *n.* (١) میری؛
فەرمانڕەوایی؛ حکومەت. (٢) فەرمانڕەوایی کردن؛ فەرمانڕەوایی؛ بەڕێوەبردن
(٣) کاربەدەستان و فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایییەک (٤) هەرێمێکی بەڕێوەبراو
(٥) کارتێکردنی وشەیەک لە وشەیەکی تر (ڕێزمان).

**governmental** (guv′ĕr-men′t'l), *adj.* تایبەتی بە فەرمانڕەوایی
یا میری؛ هی فەرمانڕەوایی؛ میری

**governor** (guv′ĕr-nēr), *n.* (١) پارێزکار یا فەرمانڕەوا بەتایبەتی
(ا) پارێزگاری دوجە یا هەرێمێکی ژێردەستە.
(ب) فەرمانڕەوای یەکێک لە ویلایەتەکانی ئەمەریکا.
(ج) بەڕێوەبەری دەزگا یا ڕێکخراوێک.
(٢) ئامێری ڕێکخەری خێرایی مەکینەیەک.

**governor general,** پارێزکاری گشتی

**governorship** (guv′ĕr-nēr-ship′), *n.* پارێزگاری؛ پارێزگارێتی

**govt.**, **Govt.**, = **government.**

**gown** (goun), *n.* (١) (ا) کراسی درێژی ژن؛ شۆر بەتایبەتی
(ب) شەوکراسی ژن یا پیاو (٢) جبە (مەلا، قەشە، قوتابیان و مامۆستایانی
زانکۆ لە ئاهەنگی دەرچووندا) (٣) ئەندامانی زانکۆ یا کۆلێج.

*v.t.* جبە لەبەرکردن

**grab** (grab), *v.t.* (١) فڕاندن؛ پەلاماردان و فڕاندن؛ پڕپیاکردن؛
هەڵپڕووسکاندن (٢) دەست بەسەردا گرتن بە ناڕەوایی؛ قۆستنەوە؛ زەوتکردن

*n.* (١) پەلاماردان و فڕاندن؛ پڕپیاکردن؛ قۆستنەوە.
(٢) شتێکی قۆزراوە یا فڕێنراو (٣) گیرەی مەکینەی بەرزکەرەوە.

**grabble** (grab′'l), *v.i.* (١) بەدەن کوتان؛ دەست کوتان.
(٢) خۆ ڕاکێشان بەسەر سکدا؛ بە دەمدا پاڵکەوتن؛ کەوتن

*v.t.* دەست بەسەردا گرتن

**grace** (grās), *n.* (١) جوانی لەخت و لار؛ لەنجەولار؛ شۆخ و شەنگی؛
ناسکی (٢) جوانی کردەوە و ڕەووشت (٣) ڕێگەی ڕاست.
(٤) چاکە؛ پیاوەتی (٥) ڕەحم؛ ڕەحمی خوایانە؛ خێروبێری خوایی.
(٦) مۆڵەت (٧) دوعا و سوپاسی خوا کردن پێش نان خواردن.
(٨) بەخشین (٩) [G-]. ناونیشانی سەردک قەشە یا دۆق بۆ لەگەڵ دووان.

*v.t.* (١) ڕێز پێدان (٢) ڕازاندنەوە

**fall from grace,** گوناە کردن؛ کردەوەیەکی زۆر ناپەسەند کردن

**in the bad grace of,** کۆک نەبوون لەگەڵدا؛ لەگەڵدا ڕێک نەبوون؛
خاتر نەویستن

**in the good grace of.** کۆک بوون لەگەڵدا؛ لەگەڵدا ڕێک بوون؛
خاتر ویستن

**with bad grace,** بە نابەدڵی؛ بە مرومۆنی؛ بە ناخۆشی خۆ

**with good grace,** بەدڵ؛ بە ڕەزامەندی و خۆشی خۆ

**graceful** (grās′fəl), *adj.* بە لەنجەولار؛ بە لەخت و لار؛
شۆخ و شەنگ؛ جوان و ڕێک و پێک

**graceless** (grās′lis), *adj.* (١) بەدنەزم؛ بێ ناموس؛ ناپەسەند.
(٢) ناقۆڵا؛ بێ لەخت و لار؛ ناشرین

**grace period,** مۆڵەت؛ ماوەی لێخۆشبوون؛ ماوەیەکی زیادەیە دەدرێت
بە قەرزار بۆ دانەوەی قەرزەکەی یا گەڕانەوەی شتی خواستراو

**gracious** (grā′shəs), *adj.* (١) ڕووخۆش؛ ناسک
(٢) بە ڕەحم؛ هاوسۆز (٣) بەخشندە بەرامبەر بە بچووکتر لە خۆ
(٤) [Archaic] جوان

*interj.* ئەی هاوار بە ماڵم

**gradate** (grā′dāt), *v.t. & v.i.* چین چین کردن؛ پلە پلە بوون؛
چوون بەناو یەکدا یا گۆڕان بەبێ سەرنج ڕاکێشان (ڕەنگ، ئاوان)

**gradation** (grā-dā′shən), *n.* (١) چین چین؛ پلە پلە؛ چین چین کردن.
(٢) گۆڕینی پلە پلە یا بەرەبەرە.
(٣) تێکەڵ بوون یا گۆڕینی وورده وورده (ڕەنگ، ئاوان).
(٤) پلە: *( There are many ~s between good and bad.)*

**grade** (grād), *n.* (١) پلە؛ نمرە. (٢) پلەی بەرزونزم بوونەوە (ڕێگە،
زەوی). (٣) بەرەوخوارکە؛ بەرەوژوورکە؛ قەدپاڵ.
(٤) پۆل؛ پلە (قوتابخانە) (٥) نمرە (قوتابخانە)
(٦) گیاندارێک کە تەنها باوکی یا دایکی ڕەسەن بێت.

*v.t.* (١) پلە پلە کردن؛ چین چین کردن؛ پۆل پۆل کردن؛ نمرە لەسەر دانان.
(٢) نمرە پێدان (قوتابی، تاقیکردنەوە).
(٣) تەخت کردن (زەوی)؛ ڕێگە یا زەمین تەخت کردن بۆ هێڵی شەمەندەفەر.
(٤) ( ~ up )، توخم چاك کردن بە جووت کردن لەگەڵ گیانداری ڕەسەنتردا

*v.i.* (١) پلەی خۆگرتن؛ جێگەی خۆگرتن لە چینێکدا.
(٢) گۆڕینی بەرەبەرە؛ بە چەند پلەیەکدا ڕۆیشتن.

**make the grade,** (١) گەیشتنە تەوقەسەری قەدپاڵ یا بەرەوژوورکەیەک.
(٢) بەسەر کۆسپدا زاڵبوون و گەیشتنە ئامانج

**the grades,** قوتابخانەی سەرەتایی.

**grader** (grād′ēr), *n.* (١) نمرەدەر. (٢) تەختکەر (مرۆڤ، مەکینە).
(٣) قوتابی پۆلێکی تایبەتی. *( a fifth ~ )*.

**grade school,** قوتابخانەی سەرەتایی.

**gradual** (graj′ōō-əl), *adj.* بەرەبەرە؛ وورده وورده.

**gradually** (graj′ōō-əl-ī), *adv.* بەرەبەرە؛ وورده وورده؛
تۆزەتۆزە؛ نەختە نەختە.

**graduate** (graj′ōō-it), *n.* (١) دەرچووی زانکۆ، کۆلێج، یا قوتابخانە.
(٢) دەفر یا شووشەیەکی پلەدار.

*v.t.* (١) دەرچوواندن (قوتابی)؛ بڕوانامەی تەواوکردنی قوتابخانە پێدان.
(٢) شووشە یا دەفر پلە پلە کردن.
(٣) پۆل پۆل کردن؛ چین چین کردن.

*v.i.* (١) وەرگرتنی بڕوانامەی تەواوکردنی قوتابخانە؛ تەواوکردنی قوتابخانە
(٢) گۆڕینی وورده وورده

*adj.* (١) دەرچوو یا تەواوکەر (قوتابی زانکۆ، کۆلێج، یا قوتابخانە).
(٢) تایبەتی بە خوێندنی بەرز: *( ~ courses)*

**graduate school,** قوتابخانەی بەرز؛ پلەی ژوور بەکالۆریۆس لە زانکۆدا.

**graduate student,** قوتابی خوێندنی باڵا، واتە ژوور بەکالۆریۆس؛
قوتابی دکتۆراو ماستەر.

**graduation** (graj′ōō-ā′shən), *n.* (١) تەواوکردنی قوتابخانە،
زانکۆ، یا کۆلێج. (٢) ئاهەنگی قوتابخانە تەواوکردن و بڕوانامە وەرگرتن
(٣) پلە پلە کردنی دەفر یا شووشەیەک. (٤) یەکێک لەم پلانە یان هەموویان
(٥) پۆل پۆل کردن

**graffiti** (grə-fē′tē), *n.pl.* نووسین و وێنە و نەخشەی سەر دیواری
شوێنی گشتی (کە بەزۆری ناپەسەندە و ناڕەزایی دەردەبڕێت)

**graffito** (grə-fē′tō), *n.* ( *pl.* **graffiti** ), نووسین و وێنە و نەخشەی
ناپەسەندی سەر دیوار و کۆڵەکە.

**graft** (graft, gräft), *n.* (١) قەڵەم (موتوربەکردن)؛ گۆپکە (موتوربەکردن).
(٢) موتوربەکردن؛ پەیوەست؛ پەیوەزکردن (٣) جێگەی موتوربە
(٤) دار یا ڕووەکی موتوربەکراو.
(٥) (ا) دزی (کاربەدەستی میری، ڕێکخراو، یا دەزگایەك)؛ دەسکەوتی قەدەغە
(ب) پارە یا شتی دزراو بەم جۆرە
(٦) تێشوو یا ئێسقانی پەیوەست پێکراو (نەشتەرکاری).

*v.t.* (١) موتوربەکردن. (٢) بەرهەم هێنان بە موتوربە (میوە، گوڵ).
(٣) دزی کردن (کاربەدەستی میری یا دەزگایەك).
(٤) پەیوەستکردنی تێشوو (نەشتەرکاری).

*v.i.* (١) موتوربەکران؛ پەیوەست بوون.
(٢) دزی کردن (کاربەدەستی میری یا دەزگایەك)

**graftage** (graf′tij, gräf′tij), *n.* (١) موتوربەکردن؛ موتوربەکاری؛ پەیوەستکردن (٢) پەیوەست بوون

**grain** (grān), *n.* (١) دەنك (گەنم، جۆ، نۆك، گەنمەشامی، نیسك... هتد)؛ کاکڵە؛ کاکل (٢) دانەوێڵە؛ دەغڵودان؛ ووشکەدان؛ خەڵە؛ دان (٣) دەنکۆڵە (لم، خوێ...) (٤) نەختێ؛ تۆزێ *( a ~ of sense)*. (٥) دەماری تەختەدارو بەرد (کە بە درێژایی تەختەدارو بەردەکەیە). (٦) سرووشت؛ باری هەستو هۆشو مێشك.

*v.t.* (١) وەك بلوور لێکردن؛ دەنك دەنك وەستان (٢) بۆیەکردن (٣) تووك لە پێستە کردنەوە

*v.i.* وەك بلوور لێهاتن؛ دەنك دەنك وەستان

against the ( or one's ) grain. دژی هەستو خواستو سرووشتی خۆ؛ بە پێچەو نەی سرووشت؛ ناپەسەند.

**grain elevator,** عەماری دانەوێڵە

**grainy** (grān′i), *adj.* (١) دانەوێڵەیی؛ دانار دانار؛ دەنکدار. (٢) دەماردار (تەختەودار)

**gram, gramme** (gram), *n.* گرام؛ غرام

**-gram** (gram), پاشگرێکە بەمانای (١) شتێکی نووسراو *( telegram)* (٢) (ا) ژمارەیەکی تایبەتی بە گرام *( kilogram)* (ب) بەشێکی گرامێك *( centigram)*.

**gramercy** (grə-mũr′si), *interj.* [Archaic], (١) زۆر سوپاس (٢) ووتەیەکە بۆ دەربڕینی سەرسامی.

**gramineous** (grə-min′i-əs), *adj.* گیایی؛ وەك گیا

**graminivorous** (gram′ə-niv′ẽr-əs), *adj.* گیاخۆر

**grammar** (gram′ẽr), *n.* (١) رێزمان؛ دەستووری زمان. (٢) پەڕتووکی رێزمان (٣) (ا) دەستووری زانیاری یا هونەرێك (ب) پەڕتووکی ئەم جۆرە دەستوورە.

**grammarian** (grə-mâr′i-ən), *n.* رێزماناس؛ زانای رێزمان؛ دەستووری زماناس

**grammar school,** (١) قوتابخانەی سەرەتایی. (٢) (ا) قوتابخانەیەك کە لاتینی تێدا بووترێتەوە لە ئینگلتەرە (ب) قوتابخانەی ناوەندی لە ئینگلتەرە

**grammatical** (grə-mat′i-k'l), *adj.* (١) تایبەتی بە رێزمان؛ رێزمانی؛ هی دەستووری زمان *(a ~ mistake)*. (٢) بەپێی رێزمان

**grammatically** (grə-mat′i-k'l-i), *adv.* لەرووی رێزمانەوە

**gramme** (gram), *n.* gram.

**gramophone** (gram′ə-fōn′), *n.* گرامەفۆن؛ سندووقی قەوان لێدان

**granary** (gran′ẽr-i), *n.* (١) عەماری دانەوێڵە (٢) ناوچەیەك کە دانەوێڵەیەکی زۆری تێدا بەرهەم دەهێنرێت.

**grand** (grand), *adj.* (١) پلە بەرز؛ پلە بەرزتر؛ گەورە *( a ~ duke)*. (٢) سەرەکی؛ گرنگترین؛ یەکەم. (٣) جوان *(a ~ scenery)*. (٤) خۆش و نایابو کەشخە *( a ~ banquet)* (٥) گرنگ؛ بەرز؛ ناودار. (٦) خۆنوێن؛ لووت بەرز؛ بەفیز. (٧) سەرجەم؛ هەموو؛ تەواو *( the ~ total)*. (٨) [Colloq.]، زۆر باشو نایاب؛ خۆشو چاك (٩) بەرز (ویژە، هونەر)؛ بڵند.

*n.* (١) پیانۆی گەورە (٢) [Slang]، هەزار دۆلار

**grand-** (grand), پێشگرێکە بەمانای هی نەوەی گەورەتر یا گەنجتر لە: *( grandfather, grandson)*

**grandam** (gran′dam), *n.* [Archaic or Rare]. (١) دایەگەورە؛ داپیرە؛ نەنك (٢) ئافرەتێکی پیر

**grandame** (gran′dām, gran′dəm), *n.* = grandam.

**grandaunt** (grand′ant′, grand′änt′), *n.* خوشکی نەنك یا باپیر؛ پوورە گەورە

**grandchild** (gran′child′, grand′chīld′), *n.* کوڕەزا یا کچەزا.

**granddad** (gran′dad′), *n.* *Also* granddady, باپیر؛ بابەگەورە (ووتەی منداڵ).

**granddaughter** (gran′dô′tẽr, grand′dô′tẽr), *n.* کچی کوڕەزا یا کچەزا.

**grand duchess,** (١) ژنی گەورە دۆق؛ هاوسەری گەورە دۆق. (٢) گەورە دۆقی ژن.

**grand duchy,** گەورە دۆق نشین؛ گەورە دۆقی ژن نشین.

**grandee** (gran-dē′), *n.* (١) بەگزادەیەکی ئیسپانی یا پورتوگالی. (٢) کەسێکی پایە بەرز؛ کەسێکی گرنگ.

**grandeur** (gran′jẽr, gran′joor), *n.* بەرزی؛ گەورەیی؛ مەزنی؛ بەناوبانگی؛ بەشکۆیی.

**grandfather** (gran′fä′thẽr, grand′fä′thẽr), *n.* باپیر؛ بابەگەورە.

**grandfather's clock,** کاتژمێرێکی گەورەی سەر دیوار

**grandfatherly** (gran′fä′thẽr-li), *adj.* (١) باپیرانە؛ باوەگەورانە. (٢) بەڕەحم؛ لێبووردە؛ بەخشندە

**grandiloquence** (gran-dil′ə-kwəns), *n.* بەکارهێنانی ووشەی زلو رازاوەو بە کەشوفش؛ قسەی زل.

**grandiloquent** (gran-dil′ə-kwənt), *adj.* ووشەی زلو رازاوەو بە کەشوفش بەکارهێنەر.

**grandiose** (gran′di-ōs′), *adj.* (١) بەشکۆ؛ مەزن؛ بڵند؛ بەرز. (٢) خۆدەرخەر؛ خۆنوێنەر؛ بە کەشوفش؛ مەزنی درۆزنە.

-grandiosely *(adv.)*; grandiosity *(n.)*; grandioseness *(n.)*.

**grand jury,** ئەنجوومەنی بەرزی سوێندخواران (کە لە مەسەلە یا داوایەك دەکۆڵێتەوەو بڕیار دەدات کە ئایا دەهێنێت بدرێت بە دادگا یان نا)

**grand larceny,** (١) دزینی پارە یا شتێك کە نرخی لە بەینی ٢٥-٥٠ دۆلاردا بێت. (٢) دزی کەم یا زۆر

**grandma** (gran′mä, grand′mä), *n.* [Colloq.], = grandmother.

**grandmother** (gran′muth′ẽr, grand′muth′ẽr), *n.* نەنك؛ داپیرە؛ دایەگەورە.

**grandmotherly** (gran′muth′ẽr-li), *adj.* (١) نەنکانە؛ نەنکی؛ داپیرە ئاسا (٢) بەڕەحم؛ زۆر بەتەنگەوەهاتوو

**grandnephew** (gran′nef′ū, grand′nef′ū), *n.* کوڕەزا یا کچەزای نێرینەی برا یا خوشك

**grandniece** (gran′nēs′, grand′nēs′), *n.* کچی برازا یا خوشکەزا

**grandpa** (gran′pä, grand′pä), *n.* [Colloq.], = grandfather.

**grandparent** (gran′pâr′ənt, grand′pâr′ənt), *n.* باپیر؛ داپیر؛ بابەگەورە؛ دایەگەورە؛ نەنك

**grand piano,** پیانۆی گەورە (کە ژێکانی ئاسۆیییە).

**grand prix,** یەکەم خەڵات؛ بەرزترین یا گەورەترین خەڵات.

**grandsir** (gran′sẽr, grand′sẽr), *n.* [Archaic], = grandsire.

**grandsire** (gran′sīr′, grand′sīr′), *n.* [Archaic], (١) باپیر؛ بابەگەورە. (٢) باووباپیر (٣) پیرەپیاو.

**grand slam,** (١) دەستێك قومار بردنەوە (٢) هەموو پێشبڕکێکان بردنەوە

**grandson** (gran′sun′, grand′sun′), *n.* کوڕی کوڕەزا یا کچەزا.

**grandstand** (gran′stand′, grand′stand′), *n.* (١) شوێنی دانیشتنی تەماشاکەران لە یاریگایەکدا کە سەری گیرابێت. (٢) تەماشاکەرانی یارییەك.

*v.i.* [Colloq.], پۆز لێدان؛ ڕەفتارکردن یا خۆنوواندن بەجۆرێك کە سەرنجی

تەماشاکەران یا گوێگران ڕاکێشن؛ فیزلێدان؛ خۆنواندن.
**grand tour,** (١) گەڕانێکی گشتی بە ئەورووپادا (لەلایەن قوتابیانی بەگزادەی ئینگلیزەوە کە بەشێک بوو لە تەواوکردنی خوێندنیان)
(٢) گەڕان یا چاو پیاگێڕانێکی گشتیو وورد.
**granduncle** (grand′uŋ′k'l, grand′uŋ′k'l), ***n.*** مامەگەورە؛ برای باپیر یا برای نەنك
**grange** (grānj), ***n.*** (١) عەماری دانەوێڵە.
(٢) کێڵگەیەك بە خانووی وەرزێرەکەو تەویلەو کایەنەوە
(٣) [ ǀ ] ، کۆمەڵێکی هەرەوەزی وەرزێران
(٤) بارەگای ئەم جۆرە کۆمەڵە هەرەوەزییە.
**granger** (grān′jẽr), ***n.*** (١) ئەندامی کۆمەڵێکی هەرەوەزی کشتوکاڵی
(٢) وەرزێر؛ جووتیار.
**granite** (gran′it), ***n.*** گرانیت، بەردێکی زۆر ڕەقو ڕەنگاوڕەنگە.
**granitoid** (gran′it-oid′), ***adj.*** لە گرانیت دەچێت؛ گرانیتی تێدایە
**granivorous** (grə-niv′ẽr-əs), ***adj.*** دانەوێڵەخۆر.
**granny, grannie** (gran′i), ***n.*** [Colloq.], (١) نەنك؛ دایەگەورە؛ داپیر. (٢) پیرێژن. (٣) کەسێکی لە ڕادە بەدەر گوێ بە شتی ووردو بێ بایەخ دەرو بە هیچ ڕازی نەبوو
**grant** (grant, gränt), ***v.t.*** (١) پێدان؛ پێدانی خواستێك؛ دان.
(٢) (ا) پێ بەخشین؛ بەخشین. (ب) کڕینو فرۆشتنی زەویو خانوو بە تاپۆ.
(٣) گریمان؛ دان پیادانان بۆ مەبەستی گفتوگۆ
***n.*** (١) پێدان؛ پێدانی خواستێك؛ دان؛ دران
(٢) بەخشیش؛ دراو؛ شتێکی بەخشراو (زەوی، خانوو، پارە... هتد).
**take for granted,** (١) بە ڕاستو براوە دانان.
(٢) بە ئاسایی دانان؛ بە هیچ نەزانین؛ بە هیچ دانان؛ بایەخ پێ نەدان؛ نرخ نەزانین؛ بە بێ نرخ زانین
**grantee** (gran′tē′, grän′tē′), ***n.*** کەسێکی شت پێ بەخشراو
**grantor** (gran′tẽr, grän′tôr′), ***n.*** کەسێکی شت بەخش.
**granular** (gran′yoo-lẽr), ***adj.*** دانەدار؛ لە دەنك پێکهاتوو
**granulate** (gran′yoo-lāt′), ***v.t. & v.i.*** (١) دانەدار؛ دانەدار کردن؛ دانەدار بوون؛ دەنك دەنك وەستان (٢) گرنج گرنج بوون
-granulation ***(n.).***
**granule** (gran′yool), ***n.*** (١) دەنکۆلە؛ دەنکێکی بچووك
(٢) شتێکی بچووك وەك دەنك
**granulite** (gran′yoo-līt′), ***n.*** گرانیولایت، بەردێکی دەنك دەنکی وەك بلووره
**grape** (grāp), ***n.*** (١) تری (٢) دارمێو؛ دارتری.
(٣) سوورێکی ئەرخەوانی. (٤) بۆمبای هێشوویی.
(٥) ( /ǀ/ ) (ا) مێخەکەی ژوور سمی ئەسپو ماین. (ب) سیلی ڕەشەووڵاخ.
**grape-fruit** (grāp′fro͞ot′), ***n.*** (١) کەبات؛ مزرە میوەیەکە لە پرتەقاڵ گەورەترە (٢) داری کەبات.
**grape sugar,** شەکری تری.
**grapevine** (grāp′vīn′), ***n.*** (١) دارەمێو؛ دارتری.
(٢) ڕێگا یا هۆیەکی نهێنی بۆ بڵاوکردنەوەو وەرگرتنی دەنگوباس:
*( to hear something through the ~ )*
(٣) ووتەووات؛ قاو.
**graph** (graf, gräf), ***n.*** نەخشە؛ وێنە؛ شێوەی ئەندازەیی
***v.t.*** پیشاندان بە نەخشە یا شێوەی ئەندازەیی.
**-graph** (graf, gräf), پاشگرێکە بەمانای (١) ئامێری نووسەر: *( telegraph)*
(٢) شتێکی نووسراو: *( monograph)* .
**graphic** (graf′ik), ***adj.*** (١) ڕوون؛ ڕوونکراوە؛ ڕوون وەك وێنە.
(٢) تایبەتی بە هونەری نەخشەیی. (٣) هی دەستنووسین. (ب) نووسراو.
(٤) تایبەتی بە نەخشەو وێنەی ئەندازەیی.
**graphic arts,** هونەرە وێنەیی یا نیگارییەکان.

**graphics** (graf′iks), ***n.pl.*** هونەری نەخشەکاری؛ هونەری وێنەی کارە ئەندازەیییەکان.
**-graphy** (graf′i), پاشگرێکە بەمانای: (١) جۆرێکی تایبەتی نووسین یا وێنەگرتن: *( calligraphy; photography)* .
(٢) زانیارییەکی باسکەر یا نیشانەهەڵدەر: *( geography)* .
**grapnel** (grap′n'l), ***n.*** (١) لەنگەر. (٢) قولاپ.
**grapple** (grap′'l), ***n.*** (١) قولاپ.
(٢) گرتن (زۆرانبازی)؛ بە توند پڕپیاکردن یا گرتن.
(٣) زۆرانبازی؛ زۆران؛ ئەمبازبوون.
***v.t.*** گرتن؛ بە توند گرتن؛ زۆران گرتن؛ ئەمبازبوون
***v.i.*** (١) قولاپ بەکارهێنان. (٢) زۆران گرتن؛ پڕ بەیەکدا کردن؛ ئەمبازبوون؛ گرتن بە توند.
-grappler ***(n.).***
**grappling** (grap′liŋ), ***n.*** (١) لەنگەر. (٢) قولاپ.
**grasp** (grasp, gräsp), ***v.t.*** (١) بە توند گرتن؛ بە قایم گرتن؛ بە دەست گرتن. (٢) پڕپیاکردن. (٣) تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرچوون.
***n.*** (١) گرتن بە دەست؛ گرتنێکی قایم؛ دەست بەیەکدا کردن.
(٢) دابینکردن؛ لەژێر دەستدا بوون. (٣) پێگەیشتن؛ توانای گەیشتن
(٤) تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرچوون؛ توانای مێشکی
**grasp at,** (١) پەلاماردان؛ دەست بۆ ڕاکێشان بۆ گرتن؛ پڕپیاکردن.
(٢) بەجۆشەوە وەرگرتن یا قبووڵ کردن.
**grasping** (gras′piŋ, gräs′piŋ), ***adj.*** (١) بگر.
(٢) چاوبرسی؛ چاو تێرنەخۆر.
**grass** (gras, gräs), ***n.*** (١) گیا؛ گژوگیا. (٢) لەوەڕگا؛ چیمەن.
(٣) [Slang]، مەریوانە.
***v.t.*** (١) لەوەڕاندن (ئاژەڵ). (٢) گیا لێ ڕوواندن.
(٣) کوشتنو دان بە زەویدا (ڕاو)؛ دان بە زەویدا (زۆرانبازی).
**go to grass,** (١) لەوەڕین. (٢) پەککەوتن؛ فەوتان؛ ڕزین. (٣) مردن
(٤) حەسانەوە؛ پشوودان.
**let the grass grow under one's feet,** کاتی خۆ بەفیڕۆدان؛ هەل لە دەست خۆ دان.
**grass-cutter** (gras′kut′ẽr, gräs′kut′ẽr), ***n.*** (١) مەکینەی چیمەن بڕین. (٢) [Colloq.]، تۆپێك کە گیای یاریگا دەپرووشێنێ (بێسبۆڵ)
**grasshopper** (gras′hop′ẽr, gräs′hop′ẽr), ***n.*** (١) کوللە.
(٢) [Military Slang]، فڕۆکەیەکی بچووك بۆ چاودێری یا سووسەکردن.
**grassland** (gras′land′, gräs′land′), ***n.*** (١) لەوەڕگا.
(٢) هەرێمێکی گژوگیایاوی.
**grass-roots** (gras′ro͞ots′, gräs′roots′), ***n.*** [Colloq.], لە- خەڵکی سادە یا جەماوەرەوە هەڵقوڵاو: *( a ~ political movement)*
**grass widow,** (١) ژنێکی تەڵاق دراو یا لە مێرد جیابووەوە.
(٢) ژنێك کە مێردەکەی لا نەبێت. (٣) ژنە دۆستێکی واز لێ هێنراو
(٤) دایکی منداڵێکی زۆڵ.
**grass widower,** پیاوێکی تەڵاق دراو یا لە ژن جیابووەوە.
**grassy** (gras′i, gräs′i), ***adj.*** (١) تایبەتی بە گژوگیا.
(٢) بە گیا داپۆشراو؛ گیایاوی. (٣) سەوز.
**grassy-green** (gras′i-grēn′, gräs′i-grēn′), ***adj.*** سەوز وەك گیا.
**grate** (grāt), ***v.t.*** (١) هاڕین؛ جنین (پەنیر). (٢) کڕاندن.
(٣) جیڕکردنەوە (ددان)؛ لەیەکخستن. (٤) پەستکردن؛ زیزکردن.
***v.i.*** (١) کڕاندن. (٢) دەنگێك لێ پەیداکردن وەك هی ددان جیڕکردنەوە.
(٣) پەستکردن؛ دڵگرتن: *( Her voice ~s on me.)* .
**grate** (grāt), ***n.*** (١) چوارچێوەیەکی شیش بۆ پەنجەرەو دەرگا.
(٢) تەیمانەی کوورە (کە ئاگرەکەی لەژێردایەو شتی دەخرێتە سەر یا لە سەری دەبرژێنری). (٣) ئاگردان؛ کوورە.
(٤) بێژنگی ئاسنین؛ تەنراوی تەل (بۆ لەبێژنگدان).

*v.t.* چوارچێوەی شیش تێخستن؛ تەیمانە تێخستن.

**grateful** (grāt′fəl), *adj.* (١) مەمنون؛ سوپاسکەر؛ بە چاکە زان ***( to be ~ to somebody)***

(٢) جێگەی سوپاسە؛ خۆش؛ باش.

**grater** (grāt′ẽr), *n.* نامێری جنینی پەنیرو سەوزە؛ پەنیرجن.

**gratification** (grat′ə-fi-kā′shən), *n.* (١) دڵخۆش کردن؛ دڵخۆش بوون؛ دڵخۆشی؛ خۆشی؛ ڕازی کردن. (٢) دڵخۆشکەرە؛ خۆشی پێدەر.

(٣) پاداشت؛ خەڵات؛ بەخشیش.

**gratify** (grat′ə-fī′), *v.t.* (١) دڵخۆش کردن؛ خۆشی پێدان؛ ڕازی کردن.

(٢) دار بە دەمەوە؛ ناز کێشان؛ لاواندنەوە. (٣) [Archaic]، پاداشت دانەوە.

**-gratifier** *(n.).*

**gratifying** (grat′ə-fī′iŋ), *adj.* دڵخۆشکەر؛ خۆش؛ خۆشی پێدەر؛ باش؛ بەدڵ بوو

**grating** (grāt′iŋ), *n.* چوارچێوەی شیش بۆ پەنجەرەو دەرگا.

**grating** (grāt′iŋ), *adj.* (١) دەنگێکی ناساز لێوەهات وەك هی مەتجەل کراندن؛ مووچرکە بە لەشدا هێنەر (دەنگ). (٢) ناخۆش؛ پەستکەر.

**gratis** (grā′tis, grat′is), *adv. & adj.* خۆرایی؛ بەلاش؛ مفت.

**gratitude** (grat′ə-tōōd′, grat′ə-tūd′), *n.* مەمنوونی؛ سوپاس؛ مەمنوونێتی؛ مەمنوون بوون؛ بە چاکە زانین.

**gratuitous** (grə-tōō′ə-təs, grə-tū′ə-təs), *adj.* (١) خۆرایی؛ بەلاش (٢) بێ هۆ؛ نابەجێ؛ بێ نەویست؛ ناپێویست

**gratuitous contract,** قۆنتەراتێك كە سوودی قۆنتەراتچییەکەی تێدا بێت

**gratuity** (grə-tōō′ə-ti, grə-tū′ə-ti), *n.* بەخشیش

**gratulate** (grach′oo-lāt′), *v.t.* [Archaic], (١) پێ خۆش بوون؛ دڵ پێ خۆش بوون (٢) پیرۆزبایی لێکردن.

**-gratulation** *(n.)*; **gratulatory** *(adj.).*

**grave** (grāv), *adj.* (١) گرنگ ***( a ~ matter; ~ doubts)*** .

(٢) پڕ مەترسی؛ ستەم؛ مەترسیدار: ***( a ~ illness)*** .

(٣) مڕومۆن؛ پەست؛ ناوچەوان گرژ

(٤) ناشرین یا مردوو (ڕەنگ): ***( ~ colors)***

(٥) نزم ناواز (مۆسیقا، دەنگ).

**-gravely** *(adv.)*; **graveness** *(n.).*

**grave** (grāv), *n.* (١) گۆڕ؛ ئارامگا. (٢) مردن

*v.t.* (١) (ا) [Obs.]، هەڵکەندن. (ب) [Archaic]، ناشتن.

(٢) هەڵکەندن (پەیکەرکاری)؛ داتاشین؛ داتراشین. (٣) لەسەر هەڵکەندن.

(٤) چەسپاندن

**have one foot in the grave,** لە گیانەلادا بوون؛ سەر لە گوێی گۆڕ لەرزین.

**make one turn in one's grave,** کردنی کارێکی ناپەسەند کە کەسێکی مردووی زۆر پەست دەکرد ئەگەر زیندوو بووایە.

**grave** (grāv), *v.t.* پاك کردنەوەی دیواری دەرەوەی کەشتی و قیر لێدانی.

**grave-clothes** (grāv′klōz′, grāv′klō*thz*′), *n.* ئەو بەرگەی کە مردووی پێوە دەنێژرێت

**grave-digger** (grāv′dig′ẽr), *n.* گۆڕهەڵکەن

**gravel** (grav′′l), *n.* (١) زیخ؛ چەو (٢) بەردی ناو گورچیلە یا میزەڵدان.

*v.t.* (١) چەوڕێژکردن (ڕێگە) (٢) لە زەوی دانی کەشتی یا بەلەم لە کەناری زیخاوی دەریا یا ڕووباردا (٣) تەریق کردنەوە یا سەر لێ شێواندنی دوورێنەر.

(٤) ئەسپ شەل کردن (بە زیخی ناو سم یا ژێر ناڵ).

(٥) [Colloq.]، پەستکردن.

**-gravelly** *(adv.).*

**gravely** (grāv′li), *adv.* ئێجگار؛ زۆر؛ جێگەی مەترسییە: ***( He is ~ ill.)***

**graven** (grāv′′n), *alternative past participle of* **grave.**

***adj.*** (١) هەڵکەنراو (لەسەر دار، تەختە، ئاسن، بەرد... هتد). (٢) چەسپێنراو.

**graver** (grāv′ẽr), *n.* (١) ئەسکەنە.

(٢) مرۆڤی شت هەڵکەن لەسەر بەردو دارو ئاسن.

**gravestone** (grāv′stōn′), *n.* کێلە بەرد؛ کێلی گۆڕ؛ کێل.

**graveyard** (grāv′yärd′), *n.* گۆڕستان؛ گۆڕخانە؛ قەبرسان.

**gravitate** (grav′ə-tāt′), *v.i.* (١) بەپێی ڕاکێشانی زەوی یا موگناتیسی بزوان (٢) نیشتن (لە بنی ئاو یا شلەدا)؛ نوقم بوون.

(٣) بزواندن بەرەو مرۆڤ یا شتێکەوە؛ ڕاکێشران بەرەو.

**gravitation** (grav′ə-tā′shən), *n.* (١) بەرەو یەکتر چوون یا ڕاکێشران؛ ڕاکێشران؛ چوون بەرەو.

(٢) ڕاکێشانی زەوی؛ ڕاکێشانی موگناتیسی (فیزیا).

**-gravitational** *(adj.)*; **gravitationally** *(adv.).*

**gravity** (grav′ə-ti), *n.* (١) (ا) بە گرنگی گرتن (ڕەووشت، کردەوە)؛ گرنگی. (ب) مەترسی؛ ڕادەی مەترسی یا ترسناکی.

(ج) پلەی تاوانباری یا گوناهباری.

(٢) قورسی؛ قورسایی: ***( center of ~ )***

(٣) نزمی ئاواز (مۆسیقا).

(٤) ڕاکێشانی زەوی (فیزیا)؛ هێزی ڕاکێشان؛ ڕاکێشانی موگناتیسی

**gravy** (grā′vi), *n.* (١) چەوراوی گۆشت

(٢) شلەیەك كە لە چەوراوی گۆشت و ئاردو خوێ و ئاڵەت دروست دەکرێت (دەکرێت بەسەر خواردەمەنیدا).

**gray** (grā), *adj.* (١) خۆڵەمێشی (ڕەنگ)؛ بۆر؛ بۆز؛ ڕەنگێکی مردوو.

(٢) ناخۆش (ئاووهەوا، ژیان... هتد)؛ ناسوودە نەبەخش؛ پەستکەر؛ تاریك

(٣) سپی (قژ). (٤) پیر.

***n.*** (١) ڕەنگی خۆڵەمێشی یا بۆر. (٢) گیاندار یا شتێکی بۆر (بەتایبەتی ئەسپ).

(٣) کەسێك کە جلی خۆڵەمێشی لەبەر بکات. (٤) قوماشی بۆر.

*v.t. & v.i.* بۆرکردن؛ سپی بوون (قژ).

**grayhound** (grā′hound′), *n.* = **greyhound.**

**grayish** (grā′ish), *adj.* بۆرکار؛ بۆز؛ نزیك لە خۆڵەمێشییەوە.

**graze** (grāz), *v.t.* (١) لەوەڕاندن؛ لەوەڕین؛ کردنە لەوەڕگاوە (ئاژەڵ).

(٢) ئاگاداری ئاژەڵ بوون لە لەوەڕگادا.

*v.i.* لەوەڕین؛ لەوەڕان.

**graze** (grāz), *v.t.* (١) ڕووشاندن (گوللە)؛ هەڵڕووشاندن؛ چیغ کردن (گوللە). (٢) لێخشان؛ بە ئاستەم بەرکەوتن؛ بە ئاستەم لێکەوتن.

*v.i.* ڕووشان؛ بە ئاستەم بەرکەوتن.

*n.* (١) ڕووشان؛ بە ئاستەم بەرکەوتن. (٢) ڕووشاوی.

**grazier** (grā′zhẽr), *n.* [Chiefly British], گاوان.

**grease** (grēs), *n.* (١) ڕۆن؛ ڕۆنی گیاندار؛ چەوری. (٢) پیو.

(٣) ڕۆنی چەورکردن؛ گریس؛ ڕۆنی مەکینە

(٤) هەوکردنی قولەپێی ئەسپ و ئەو کێمەی لێی دێت.

(٥) (ا) چەوری بەرگن یا خوری تازە بڕاوە. (ب) خوری پاك نەکراوە؛ بەرگن.

*v.t.* (١) چەورکردن.

(٢) دەم چەورکردن؛ بەرتیل پێدان: ***| ~ the hand ( or palm ) |***

**grease monkey,** [Slang], فیتەری ئوتومبیل و فڕۆکە.

**grease paint,** بۆیەو شتومەکی مکیاجی ئەکتەر.

**greaser** (grēs′ẽr, grēz′ẽr), *n.* (١) چەورکەر (مرۆڤ، ئامێر).

(٢) [Slang]، مەکسیکی یا ئەمەریکایییەکی لاتینی (لەڕووی سووکییەوە).

**greasy** (grēs′i, grēz′i), *adj.* (١) چەورکراو؛ ڕۆن لێدراو؛ پیس.

(٢) چەور (خواردەمەنی)؛ ڕۆناوی: ***( ~ food)*** .

(٣) خز؛ خلیسك؛ لووس.

**-greasily** *(adv.)*; **greasiness** *(n.).*

**great** (grāt), *adj.* (١) زل؛ گەورە (قەوارە). (٢) زۆر (ژمارە).

(٣) دوورودرێژ (ماوە، کات): ***( a ~ while)*** .

(٤) ئێجگار زۆر؛ توندوتیژ: ***( ~ pain)*** .

(٥) زۆر (ڕادە): ***( to a ~ extent)*** .

(٦) بەناوبانگ؛ ناودار؛ گەورە؛ پایە بەرز: ***( a ~ writer)***

(٧) مەزن؛ گەورە؛ بەرز: ***( a ~ man)***.

(٨) گەورە ***( the G~ War)***.

(٩) گەورەتر یا گەنجتر بە یەك پشت ***( ~ grandmother; ~ grandson)***.

(١٠) [Colloq.]، کارامە؛ بزان: ***( He is ~ at tennis.)***.

(١١) [Colloq.]، زۆرباش؛ نایاب؛ زۆر چاك

(١٢) [Archaic]، سکپڕ.

*adv.* [Colloq.], زۆر باش؛ زۆر چاك؛ بە باشی.

*n.* پیاوی گەورە؛ مرۆڤی پایە بەرزو بەناوبانگ:

***( Many of the nation's ~s were there.)***

**-greatness** *(n.)*.

**great** on, [Colloq.], بە جۆش

**the great,** پیاوە گەورەکان؛ مرۆڤە مەزنەکان.

**great-aunt** (grāt′ant′, grāt′änt′), *n.* = **grandaunt.**

**Great Bear,** وورچی گەورە کۆنەستێرەیەکە؛ حەوتە برا؛ حەوتەوانە. (هەروەها: " **Big Dipper** " و " **Ursa Major** ").

**Great Britain,** بەریتانیای گەورە (کە بریتی‌یە لە ئینگلتەرەو ویلزو نوسکوتلەندە.

**great Dane,** جۆرە سەگێکی گەورەی بەهێزی توورك کورتە.

**Great Divide,** (١) ناوبڕگەیەکی سەرەکی بەتایبەتی شاخی " ڕۆکی " لە ئەمەریکای باکوور. (٢) (ا) مردن؛ کۆچی دوایی. (ب) تەنگوچەلەمەیەکی گەورە.

**great-grandchild** (grāt′gran′chīld′, grāt′grand′child′), *n.* کورەزازا؛ کچەزازا.

**great-granddaughter** (grāt′gran′dô′tēr, grāt′grand′-dô′tēr), *n.* کچی کورەزاو کچەزا.

**great-grandfather** (grāt′gran′fä′*th*ēr, grāt′grand′fä′-*th*ēr), *n.* باپیرەگەورە؛ باوکی باپیر یا نەنك.

**great-grandmother** (grāt′gran′mu*th*′ēr, grāt′grand′-mu*th*′ēr), *n.* داپیرەگەورە

**great-grandparent** (grāt′gran′pâr′ənt, grāt′grand′-pâr′ənt), *n.* داپیرەگەورە؛ باپیرەگەورە.

**great-grandson** (grāt′gran′sun′, grāt′grand′sun′), *n.* کوڕی کوڕەزا؛ کوڕی کچەزا.

**great-hearted** (grāt′här′tid), *adj.* (١) ئازا؛ چاونەترس؛ بەجەرگ. (٢) دڵ فراوان؛ بدە؛ بەخشندە.

**greatly** (grāt′li), *adv.* (١) تێجگار زۆر؛ زۆر. (٢) بە سەربەرزی؛ بە شەرەفەوە؛ بە دەستوورێکی بەرز.

**great-nephew** (grāt′nef′ū), *n.* = **grand-nephew.**

**great-niece** (grāt′nēs′), *n.* = **grand-niece.**

**great-uncle** (grāt′uŋ′k′l), *n.* = **grand-uncle.**

**greaves** (grēvz), *n.pl.* زرێی لاق (لە قولەقاچەوە هەتا ئەژنۆ).

**grebe** (grēb), *n.* مەلێکی ئاوی‌یە.

**Grecian** (grē′shən), *adj.* یۆنانی؛ گریك

*n.* (١) یۆنانی‌یەك؛ کەسێکی یۆنانی یا گریك. (٢) زانای زمانی یۆنانی یا گریك.

**Greco-** (grē′kō′), پێشگرێکە بەمانای یۆنانی؛ گریك.

**Greco-Roman** (grē′kō-rō′mən), *adj.* تایبەتی بە یۆنان‌و ڕۆما.

**Greece** (grēs), *n.* یۆنان.

**greed** (grēd), *n.* چاوبرسێتی؛ بە هیچ تێر نەخواردن؛ چڵێسی.

**greedy** (grēd′i), *adj.* چاوبرسی؛ بە هیچ تێرنەخۆر؛ چڵێس.

**-greedily** *(adv.)*; **greediness** *(n.)*.

**Greek** (grēk), *n.* (١) یۆنانی؛ کەسێکی یۆنانی یا گریك. (٢) زمانی یۆنانی یا گریکی. (٣) [Slang]، ئەندامی ڕێکخراوێکی قوتابیانی کوڕی زانکۆ کە لە خانوویەکدا پێکەوە دەژین. (٤) [Obs.]، برادەرێکی نزیك.

*adj.* تایبەتی بە یۆنان‌و گەلەکەی‌و زمانەکەی‌و کلتوورەکەی.

**green** (grēn), *adj.* (١) سەوز. (٢) ڕەنگ زەرد یا سەوز (لە ترسدا یا بەهۆی نەخۆشی‌یەوە). (٣) تازە؛ بەتین:

***( Recollections of his youth were still ~ in his mind.)***

(٤) فەریك؛ کاڵ‌وکرچ؛ نەگەییو؛ کاڵ. (٥) تازەکوورە؛ دنیا نەدیو؛ ناکام؛ هەرزە. (٦) ساویلکە. (٧) تازە؛ نوێ.

*n.* (١) سەوز؛ ڕەنگی سەوز. (٢) خومی سەوز. (٣) جل‌وبەرگی سەوز. (٤) (*pl.*) گەڵا و لقی سەوز (بۆ ڕازاندنەوە). (٥) (*pl.*) سەوزە (کاهو، سپیناغ). (٦) چیمەنێك کە بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکاربهێنرێت. (٧) یاریگای گۆڵف (کە هەمووی چیمەنە).

*v.t. & v.i.* سەوزکردن؛ ڕەنگ سەوز بوون.

**green with envy,** (١) زۆر دڵ پیس. (٢) زۆر بەخیل.

**greenery** (grēn′ēr-i), *n.* (١) سەوزە؛ شینایی؛ سەوزی؛ سەوزایی. (٢) شەتڵگا؛ جامخانەی گوڵ‌و نەمام؛ ڕووەك‌و گوڵخانە.

**green-eyed** (grēn′īd′), *adj.* (١) چاو سەوز. (٢) (ا) دڵ پیس. (ب) بەخیل.

**green-grocer** (grēn′grō′sēr), *n.* سەوزەفرۆش.

**green-grocery** (grēn′grō′sēr-i), *n.* (١) فرۆشگای سەوزە؛ دووکانی سەوزەفرۆش. (٢) (*pl.*) سەوزە؛ سەوزەوات.

**green-horn** (grēn′hôrn′), *n.* (١) کەسێکی تازەکوورە، هەرزە، یا ناکام. (٢) کەسێکی ساویلکە. (٣) [Colloq.]، لانەواز یا کۆچکەرێکی تازە (لەڕووی گاڵتەوە)

**greenhouse** (grēn′hous′), *n.* شەتڵگای شووشە: خانوویەکی شووشەی گەرمە بۆ نەمام" جامخانەی گوڵ‌و ڕووەك‌و نەمام" ڕووەك‌و نەمام‌و گوڵزار.

**greenish** (grēn′ish), *adj.* سەوزباو؛ سەوزکار.

**green light,** (١) چرای سەوز (بۆ هاتوچۆی ئوتومبیل لەسەر شەقام)، واتە ڕێگەپێدان بە ڕۆیشتن. (٢) [Colloq.]، دەسەلات پێدان یا ڕێگەپێدان بە کردنی کارێك. [ *to give ( or get ) the ~* ].

**greenness** (grēn′nis), *n.* سەوزی؛ سەوزایی؛ سەوزێتی.

**green onion,** تەرە پیاز.

**green pepper,** بیبەری سەوز؛ دەلوبیبەری سەوز.

**green-room** (grēn′rōōm′, grēn′room′), *n.* ژووری چاوەڕێ‌و حەوانەوەی ئەکتەران لە هەندێ شانۆدا.

**green-sickness** (grēn′sik′nis), *n.* جۆرە نەخۆشی‌یەکی کەم خوێنی‌یە کە ڕەنگی پێست سەوزباو دەکات.

**greensward** (grēn′swôrd′), *n.* گیای سەوز؛ چیمەن.

**green thumb,** دەستباشی یا بە بەرەکەتی بۆ ڕووەك ڕواندن؛ شت باش بە دەست ڕووان.

**greenwood** (grēn′wood′), *n.* دارستانی سەوز.

**greet** (grēt), *v.t.* (١) سڵاولێکردن؛ چاك‌وچۆنی لەگەڵ کردن (٢) بەخێرهاتن کردن؛ پێشوازی کردن.

**greeting** (grēt′iŋ), *n.* (١) سڵاوکردن؛ چاك‌وچۆنی کردن؛ سڵاو. (٢) سڵاو لە کەسێکی دوور یا نادیارەوە.

**gregarious** (gri-gâr′i-əs), *adj.* (١) لە کۆمەڵدا ژیاو. (٢) کۆمەڵخواز؛ سەربەدەرەوە؛ حەزکەر لە هاودەمی مرۆڤ. (٣) تایبەتی بە کۆمەڵ یا جەماوەر. (٤) بە کۆمەڵ ڕووان (ڕووەکناسی)

**gremlin** (grem′lin), *n.* (١) گیاندارێکی ئەفسانەیی کەتنچی وەك جنۆکەیە. (٢) کەسێکی کەتنبازو بەگۆبەنگ.

**grenade** (gri-nād′), *n.* نارنجۆك.

**grenadier** (gren′ə-dēr′), *n.* (١) نارنجۆك هاوێژ (سەرباز). (٢) جۆرە ماسی‌یەکە.

**grew** (grōō), *past tense of* **grow.**

**grewsome** (grōō′səm), *adj.* = **gruesome.**

**grey** (grā), *adj., n., v.t. & v.i.* = **gray**: ( British Spelling ).
**greyhound** (grā′hound′), *n.* تانجی
**grid** (grid), *n.* (١) کووره؛ مقەلی؛ شیشی ئاسنی تەنراوی سەر ئاگردان
(بۆ گۆشت برژاندن). (٢) جەمسەری ئەلەکتریك.
(٣) یاریگای فوتبۆلی ئەمەریکی
*adj.* [Slang], تایبەتی بە یاری فوتبۆلی ئەمەریکی
**griddle** (grid′'l), *n.* تاوە یا دەفریکی ئاسنی پەل (بۆ کیك تیدا لینان)
*v.t.* کیك لینان بە تاوەیەکی وەهادا
**griddle-cake** (grid′'l-kāk′), *n.* کیکیکی تەنکی پان.
**gridiron** (grid′ī′ẽrn), *n.* (١) چوارچیوە یا تەیمانەی کوورە
(بۆ گۆشت لەسەر برژاندن). (٢) یاریگای فوتبۆلی ئەمەریکی.
**grief** (grēf), *n.* (١) خەفەت؛ داخ و خەفەت؛ خەم و خەفەت؛ شیوەن؛ خەم؛
داخ؛ سوێ. (٢) هۆی داخ و خەفەت. (٣) [Obs.]، (أ) ئێش و ئازار؛ ناخۆشی.
(ب) هۆی ئێش و ئازار
**come to grief,** ژێرکەوتن؛ سەرنەکەوتن؛ تووشی ناخۆشی بوون.
**grief-stricken** (grēf′strik′ən), *adj.* خەفەتبار؛ خەمبار؛
دلشکست
**grievance** (grēv′əns), *n.* (١) باریکی نارەوا (کە شایستەی سکالا
بێت). (٢) سکالا؛ شکات؛ گلەیی. (٣) [Obs.]، (أ) ئازاردان؛ زیان پێ گەیاندن؛
تووشی ناخۆشی کردن. (ب) هۆی ئازاردان.
**grieve** (grēv), *v.t.* (١) خەم و خەفەت پێدان؛ تووشی داخ و سوێ کردن؛
دلشکست کردن. (٢) [Archaic]، ئازاردان؛ زیان پێ گەیاندن.
*v.i.* خەفەت خواردن؛ خەم و خەفەت خواردن؛ شین کردن؛ بۆ گریان؛ بۆ لاوانەوە.
**grievous** (grēv′əs), *adj.* (١) داخ و خەفەت پێدەر؛ ناخۆش.
(٢) خەفەتبار؛ داخ و خەفەتاوی. *( a ~ cry)* .
(٣) بە ئازار؛ بە ئێش و ئازار؛ بەتین (ئێش، ناخۆشی): *( ~ pain)* .
(٤) زۆر ناپەسەند؛ زۆر خراپ؛ بەد: *( a ~ crime)*
**griffin, griffon, gryphon** (grif′in), *n.* (١) گیانداریکی
ئەفسانەیی یە سەری سیسارك و لەشی شێری هەیە. (٢) وێنەی ئەم گیاندارە
ئەفسانەیی یە وەك درووشمێکی خانەدانی، خێلەکی، یا سوارچاکی.
**griffon** (grif′ən), *n.* (١) griffin. (٢) جۆرە سەگێکی تووك لوولە
**grill** (gril), *v.t.* (١) برژاندن لەسەر کوورە؛ لێنانی خواردەمەنی لە فرندا
(٢) ئازاردان بە گەرما؛ سووتاندن. (٣) پرسیارلێکردن بە توندوتیژی و ووردی.
*n.* (١) کوورە؛ شیشی ئاگردان (کە گۆشت و شتی تری لەسەر دەبرژێنرێت)؛
مقەلی. (٢) گۆشت و شتی برژاو. (٣) چێشتخانەی خواردەمەنی برژاو.
**grille** (gril), *n.* چوارچێوەیەکی تەنراو یا تەیمانەداری ڕازاوە
کە دەخرێتە دەرگا و پەنجەرەوە.
**grilled** (grild), *adj.* (١) چوارچێوەی تەیمانەدار (دەرگا و پەنجەرە)
(٢) برژاو (گۆشت و خواردەمەنی تر)
**grill-room** (gril′rōōm′, gril′room′), *n.* چێشتخانەی
خواردەمەنی برژاو
**grim** (grim), *adj.* (١) دڕ؛ دڕندانە؛ بێ ڕەحم؛ توندوتیژ.
(٢) مڕومۆن (گرژ دەموچاو)؛ مۆن؛ ڕوو گرژ و تاڵ.
(٣) ناخۆش (دەنگوباس، کار): *( a ~ task; ~ news)* .
(٤) تایبەتی بە شتی دڵ پەستکەر و ناپەسەند و تاریك: *( ~ humor)* .
**grimace** (gri-mās′), *n.* گرژی دەموچاو؛ مڕومۆنی (لە ئێش و ئازاردا)؛
یاریکردن بە دەموچاوی خۆ بۆ گاڵتەپێکردن یا هێنانە پێکەنین.
*v.i.* دەموچاو گرژ کردن؛ دەموچاو مڕومۆن کردن؛ دەموچاوی خۆ ناشرین
کردن بۆ گاڵتەپێکردن یا هێنانە پێکەنین
**grimalkin** (gri-mal′kin, gri-môl′kin), *n.* (١) مێ پشیلەیەکی
پیر. (٢) پیرێژنێکی بەدخوازی ناپەسەند
**grime** (grīm), *n.* بەڵغ؛ چڵك و پیسی ووشك بووەوە
*v.t.* پیس کردن؛ چڵکن کردن؛ بەڵغ پێگرتن
**grimy** (grīm′i), *adj.* بەڵغن؛ چڵکن؛ پیس
**grin** (grin), *v.i.* (١) زەردەخەنەگرتن
(٢) بزەگرتن (بۆ لاقرتێ، گاڵتەپێکردن، ڕەووشتی منداڵانە نواندن).
*v.t.* هەست دەربڕین بە زەردەخەنە یا بزەگرتن.
*n.* زەردەخەنە؛ بزە.
**grind** (grīnd), *v.t.* (١) هاڕین؛ کوتان (گۆشت، گەنم)؛ کڕەکردن؛
قیمەکردن (گۆشت)؛ ووردکردن. (٢) پێشێل کردن؛ چەوساندنەوە؛ هاڕین
لەژێر زەبروزەنگدا. (٣) تیژکردنەوە (چەقۆ، تەورداس، تەور... هتد).
(٤) پەستنەوە؛ جیڕکردنەوە (ددان)؛ لەیەك گیرکردن؛ لێکخستن:
*( He ground his teeth.; She ground her heel into the dirt.)*
(٥) خستنەکار (مەکینەی هاڕین).
(٦) [Colloq.]، بەزۆر خستنە مێشکەوە؛ بەزۆر فێرکردن:
*( The boy's teacher had to ~ the lesson into his head.)*
*v.i.* (١) هاڕین؛ ووردکردن؛ قیمەکردن؛ کوتان؛ کڕەکردن.
(٢) بە ئاسانی کوتران: *( Some wheats ~ better than others.)*
(٣) لەیەککەوتن؛ کڕەکڕهاتن.
(٤) [Colloq.]، زۆر هەوڵدان لە کار یا لە خوێندندا؛ هەمیشە کۆشش کردن.
*n.* (١) هاڕین؛ کوتان؛ قیمەکردن؛ ووردکردن.
(٢) کارێك یا ئەرکێکی ناخۆش و گران.
(٣) [Colloq.]، قوتابییەکی زۆر کۆششکەر.
**grinder** (grīn′dẽr), *n.* (١) چەخماخچی؛ کەسێك کە چەقۆ و تیغی تر
تیژ دەکاتەوە. (٢) مەکینەی قیمەکردن؛ گۆشت کوت؛ دەستاڕ؛ بەردئاش؛
مەکینەی تیغ تیژکردنەوە. (٣) کاکیلە.
(٤) (*pl.*) [Colloq.]، ددان.
**grindstone** (grīnd′stōn′), *n.* (١) بەردئاش.
(٢) بەردی چەقۆ تیژکردن؛ ئامێری تیغ تیژکردن؛ بەردی چەخماخچی؛ زبرە.
**keep ( or have or put ) one's nose to the grindstone,**
هەمیشە کۆشش کردن و کارکردن.
**gringo** (griŋ′gō), *n.* ئەمەریکییەك یا ئینگلیزێك؛ کەسێکی سپی.
**grip** (grip), *n.* (١) بە توندگرتنی شتێك (بە دەست، بە ددان، یا
بە ئامێرێك). (٢) چۆنێتی ئەم گرتنە
(٣) تەوقەکردنی ئەندامانی کۆمەڵێکی نهێنی.
(٤) هێزی بە دەستەوەگرتن؛ هێزی دەست: *( His hand has lost its ~ .)*
(٥) توانای تێگەیشتن.
(٦) زاڵبوون بەسەردا؛ دابینکردن:
*( in the ~ of disease; get a ~ on yourself)*
(٧) گیرە؛ مەنگەنە. (٨) مشتوو؛ دەسك.
(٩) جانتا؛ باوڵ. (١٠) ئازارێکی تیژی لەپڕ.
(١١) [Slang]، کرێکاری سەر شانۆ (بۆ ئامادەکردنی دیمەن و ئەلەکتریك و
شتی پێویستی تر).
(١٢) جۆری بە دەستەوەگرتنی ڕاکێتی تەنس یا داری یاری گۆلف... هتد
*v.t.* (١) بە قایم گرتنی شتێك (بە دەست، ددان، یا بە ئامێرێك).
(٢) تەوقەکردن؛ دەست بە دەستدا کردن.
(٣) پێوەنووساندن؛ بە توند پێکەوەنان. (٤) سەرنج ڕاکێشان.
(٥) دابینکردن.
**come to grips,** (١) ئەمبازی یەکتر بوون؛ پڕ بەیەکدا کردن.
(٢) ( **with ~** )، هەوڵ لەگەڵدا دان بۆ چارەسەری کردن:
*( to come to grips with one's problems)*
**gripe** (grīp), *v.t.* (١) بە توند گرتن؛ بە قایم دەست پێوەگرتن.
(٢) ئازاردان؛ چەوساندنەوە؛ خەفەت پێدان. (٣) تووشی سك ئێشە کردن
(٤) [Slang]، پەستکردن.
*v.i.* (١) سك ئێشان؛ تووشی سك ئێشە بوون.
(٢) [Archaic]، بە توند گرتن. (٣) [Slang]، سکالاکردن؛ بۆڵە بۆڵ کردن
*n.* (١) بە توند گرتن. (٢) دابینکردن. (٣) ئێش و ئازار؛ ناخۆشی.
(٤) (*pl.*) سك ئێشەیەکی تیژ. (٥) دەسك؛ مشتوو. (٦) گیرە.
(٧) [Slang]، بۆڵەبۆڵ؛ بۆڵە؛ سکالا.
**grisly** (griz′li), *adj.* جەرگبڕ؛ ترسناك؛ زۆر بەد و ناپەسەند:

*(a ~ crime)*
-grisliness *(n.)*.
**grist** (grist), *n.* (١) گەنمی ئامادەکراو بۆ کوتان.
(٢) ئارد؛ گەنمی کوتراو. (٣) [Colloq.]. هەند
**grist to one's mill,** شتێکی بەسوود
**gristle** (gris′'l), *n.* کرکراگە.
**gristmill** (grist′mil′), *n.* ئاش
**grit** (grit), *n.* (١) زیخ؛ دەنکە لم؛ دەنکە زیخ
(٢) بەردێکی رەقی زبری لمین (٣) ئازایەتی؛ ئازایی؛ کۆڵ نەدان؛ غیرەت.
*v.t.* (١) بە زیخ و لم داپۆشین (٢) ددان جیڕکردنەوە.
*v.i.* کرەکرکردن؛ لێکخشاندن
**grits** (grits), *n.* جۆرە هەرزنێکی هاڕاوە وەك لەپەی ساوەر (بەتایبەتی لە لای خوارووی ئەمەریکا دەخورێت).
**grizzle** (griz′'l), *n.* (١) (ا) قژی بۆز یا خۆڵەمێشی
(ب) باروکەی بۆز (٢) رەنگی خۆڵەمێشی.
*v.t. & v.i.* وەك خۆڵەمێشی لێکردن؛ بۆرکردن؛ بۆربوون.
*adj.* خۆڵەمێشی؛ بۆر
**grizzly** (griz′li), *adj.* بۆر؛ خۆڵەمێشی
*n.* وورچێکی تووك قاوەیی یا رەشتاڵەی دڕی گەورەی ئەمەریکییە.
**grizzly bear,** وورچێکی تووك قاوەیی یا رەشتاڵەی دڕی ئەمەریکییە.
**groan** (grōn), *v.i.* (١) ناڵاندن؛ نرکاندن؛ نرکەنرك کردن؛ ناڵین.
(٢) لووراندن (با: *(The wind ~s.)*
(٣) ناڵەهاتن لەژێر چەوسانەوەدا
(٤) بار قورس بوون؛ نقەنق کردن لەژێر باری قورسدا.
*v.t.* ناڵاندن؛ ناڵەناڵ کردن.
*n.* ناڵە؛ ناڵەناڵ؛ ناڵین؛ ئاهو ناڵە؛ نکە
**grocer** (grō′sẽr), *n.* دووکاندار؛ ووردەفرۆش؛ بەقاڵ
**grocery** (grō′sẽr-i), *n.* (١) دووکانداری؛ دووکاندارێتی؛ بەقاڵی.
(٢) دووکان (هی خواردەمەنی و ووردە شتی ناومال)
(٣) (*pl.*) فرۆتەنی دووکان (خواردەمەنی و ووردە شتی ناومال).
**grog** (grog), *n.* (١) خواردنەوەی سەرخۆشکەر (کە ئاوی تێکەڵاو دەکرێت).
(٢) خواردنەوەی سەرخۆشکەر.
**groggy** (grog′i), *adj.* (١) [Colloq.]. سەرخۆش؛ مەست.
(٢) گێژو بێ هێزو شلۆق و بەم لاو بەولادا کەوتوو (بەهۆی لێدان، نەخۆشی، یا بێ خەوییەوە).
-groggily *(adv.)*; grogginess *(n.)*.
**groin** (groin), *n.* (١) ناوگەڵ؛ پێشەڵ؛ گەڵوگون؛ گەڵوقوز.
(٢) شوێنی لێکدانی دوو تاق (خانووسازی).
**groom** (grōōm, groom), *n.* (١) مەیتەری وولاخ.
(٢) زاوا (٣) [Archaic]، (ا) پیاو. (ب) خزمەتکار؛ بەردەستی پیاو.
(٣) ئامادەکردن و ڕاهێنانی مرۆڤ بۆ مەبەستێکی تایبەتی:
*(He was ~ed for political office.)*
**groomsman** (grōōmz′mən, groomz′mən), *n.* برازاوا
**groove** (grōōv), *n.* (١) دێراو؛ درز؛ هێڵ؛ قلیش؛ تلیش؛ کەندر.
(٢) چاڵ و جۆڵی (٣) رۆتین؛ یەك نەوایی.
*v.t.* کەندەك تێ کردن؛ درز تیا هەڵکەندن یا کردن؛ قلیش کردن.
**groovy** (grōōv′i), *adj.* خۆش (ڕووداو، کار، کردار... هتد)
**grope** (grōp), *v.i., v.t. & n.* پەل کوتان (وەك لە ژوورێکی تاریکدا)؛ پەلەقاژێ؛ دەست کوتان بەم لاو بەولادا (بۆ دۆزینەوەی شت یا ڕێگە).
**gross** (grōs), *adj.* (١) زۆر قەڵەو.
(٢) ئاشکرا؛ هەڵماڵراو؛ هەڵەیەکی دیار: *(a ~ violation)*.
(٣) چڕ؛ پڕ (٤) زبر.
(٥) ناشرین (ڕەوشت، کردەوە)؛ ناپەسەند؛ نابەجێ: *(~ language)*.
(٦) نەزان؛ ڕێ بەدی نەکەر.
(٧) سەرجەم؛ هەموو؛ سەروبەر؛ کۆ: *(one's ~ income)*.
*n.* (١) هەموو؛ هەمووی؛ سەرجەم. (٢) دووانگزە دەرزەن.
*v.t. & v.i.* [Colloq.], سەرجەم کردن.
**grotesque** (grō-tesk′), *adj.* (١) سەیرو ناسرووشتی و شێواو (بەرهەمی هونەری). (٢) ناشرین؛ بەدڕوو؛ بێ مانا؛ شێواو.
*n.* (١) تابلۆ یا پەیکەرێکی ناسرووشتی و سەیرو شێواو.
(٢) نەخشە یا شێوازێکی دژ بە سرووشت و ناشرین و شێواو.
**grotesquerie, grotesquery** (grō-tes′kẽr-i), *n.* (١) شتێکی ناشرین و سەیرو ڕووخسار شێواو. (٢) ناشرینی ڕووخساری شت؛ بەدڕوویی ناسرووشتی ڕواڵەت. (٣) تابلۆو پەیکەری ناسرووشتی و شێواو و سەیر
**grotto** (grot′ō), *n.* ئەشکەوت (سرووشتی یا دەستکرد).
**grouch** (grouch), *v.i.* [Colloq.], بۆڵەبۆڵ کردن و مڕومۆنی نواندن.
*n.* [Colloq.], (١) کەسێکی مڕومۆن و بۆڵەبۆڵکەر؛ کەسێکی سکاڵاکەر.
(٢) مڕومۆنی؛ تەنگەجیکڵانەیی. (٣) هۆی سکاڵا و بۆڵەبۆڵ و مڕومۆنی.
**grouchy** (grouch′i), *adj.* [Colloq.], مڕومۆن؛ مۆن؛ بێ تاقەت؛ تەنگەجیکڵانە؛ بۆڵەبۆڵ و سکاڵاکەر: *(a ~ man or woman)*
-grouchily *(adv.)*; grouchiness *(n.)*.
**ground** (ground), *n.* (١) (ا) بن؛ بنچینە. (ب) بنی دەریا.
(٢) زەمین؛ زەوی؛ ئەرز؛ زەمینە. (٣) خاك؛ زەوی؛ ڕووی زەوی؛ ووشکانی.
(٤) پارچەیەك زەوی تایبەتی: *(a hunting ~)*.
(٥) مەودای باس و گفتوگۆ.
(٦) دووری لە ئامانجەوە؛ ماوەی گەیشتن بە ئامانج.
(٧) بنچینە؛ بناغە. (٨) (*pl.*)، هۆ؛ بەڵگە. (٩) ڕوو.
(١٠) پەیوەندی ئەلەکتریکی بە زەمینەوە.
*adj.* (١) زەمینی؛ هی زەمینی؛ نزیك بە زەمین: *(~ floor)*.
(٢) لە زەمیندا ڕوواو یا ژیاو.
*v.t.* (١) خستنەسەر زەوی؛ لەسەر زەمین دانان.
(٢) لە زەوی دان (کەشتی، بەلەم). (٣) دامەزراندن؛ دانان (لەسەر بناغەی پتەو
(٤) دانان لەسەر (بەڵگە). (٥) فێرکردنی سەرەتای باسێك.
(٦) لەسەر زەمین هێشتنەوەو قەدەغەی فڕین لێکردن:
*(The plane was ~ed by bad weather.)*
(٧) گەیاندن بە زەمین (تەلی ئەلەکتریك)؛ تەل.
*v.i.* (١) کەوتنەسەر زەوی؛ کەوتنەخوارەوە.
(٢) لە زەوی دان (کەشتی، بەلەم).
**above ground,** زیندوو.
**break ground,** (١) هەڵکەندن. (٢) کێڵان.
(٣) بنچینە دانان (خانوو)؛ ڕەنگ ڕشتن (خانوو)؛ دەست بە دروستکردن (خانوو). (٤) دەستپێکردن (کار، پرۆژە، ئەرك).
**cover ground,** (١) ڕێگە بڕین؛ بڕین یا تەواوکردنی بەشێك لە ڕێگەی گەشت. (٢) کردنی بەشێك لە کار یا ئەرك.
**from the ground up,** لە بنەڕەتەوە؛ هەمووی؛ بە ووردی و تەواوی.
**gain ground,** پەرەسەندن؛ بەهێزبوون؛ پێشکەوتن.
**give ground,** کشانەوە؛ شکان؛ بەزین؛ بێ هێز بوون و بەدەستەوەدان.
**hold one's ground,** خۆ ڕاگرتن بەرامبەر بە هێرش؛ نەکشانەوە؛ واز لە ماف و جێگەی خۆ نەهێنان؛ بەرگەگرتن؛ بەرگری کردن.
**lose ground,** دواکەوتن؛ دۆڕاندن؛ بێ هێز بوون.
**on firm ground,** پتەو.
**on one's own ground,** (١) لە بارێك یا دەوروبەرێکدا کە شارەزای بیت. (٢) لە باسێکدا کە باشی بزانیت. (٣) لە شوێنی خۆتدا؛ لە ماڵەوە.
**on the ground of,** لەبەر؛ بەهۆی.
**run into the ground,** [Colloq.], لە تام کردنە دەرەوە؛ لە ڕادە بەدەر کردن.
**shift one's ground,** هەڵوێستی خۆ گۆڕین؛ جێ گۆڕکێ کردن.
**stand one's ground,** خۆ ڕاگرتن لەبەر هێرشدا؛ نەکشانەوەو نەبزوان؛ نەجووڵان؛ هەڵوێستی خۆ نەگۆڕین و بەرنەدان.
**ground** (ground), *past tense and p.p. of* **grind**.

**ground crew,** تاقمی چاك كردن و باش ڕاگرتن و پاراستنی فڕۆكە لەسەر زەمین، واتە لە فڕۆکەخانەدا.
**ground floor,** نهۆمی بەکەمی خانوو.
**groundless** (ground′lis), *adj.* بێ بەڵگە؛ درۆ؛ بێ هۆ
**groundling** (ground′liŋ), *n.* (١) (ا) ماسی لە بن ئاودا ژیاو.
(ب) گیانداری ناو زەمین یا نزیك لە زەمینەوە ژیاو
(ج) ڕووەکی تەرزفڕێدەر بەسەر زەویدا (شووتی، خەیار، ترۆزی... هتد).
(٢) تەماشاکەرێك کە لە هەرزانترین کورسیدا دادەنیشێ بۆ بینینی شانۆنامەیەك.
(٣) کەسێکی سادەو نەزان.
**grounds** (groundz), *n.pl.* (١) حەوشەو چیمەن و باخچەی خانوو یا ماڵێکی گەورە. (٢) خڵتە: *( coffee ~ )* .
(٣) بەڵگە؛ هۆ: *( ~ for divorce)* .
**ground swell,** هەستانی ئاوی دەریا بەهۆی زریان یا بوومەلەرزەیەکی دوورەوە
**ground water,** ئاوی ژێرزەمین وەك هی کانی).
**ground-work** (ground′wûrk′), *n.* بنچینە؛ بناغە
**group** (grōōp), *n.* (١) دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ.
(٢) پۆل؛ بابەت (ڕووەك، گیاندار)؛ توخم. (٣) پۆلێك فڕۆکە.
*v.t. & v.i.* کۆمەڵ کردن؛ کۆکردنەوە؛ دەستە دەستە کردن؛ پۆل پۆل کردن.
**grouper** (grōōp′ēr), *n.* جۆرە ماسییەکی گەورەیە.
**grouse** (grous), *n.* باڵندەیەکی کێوییە لە مریشك دەچێت؛ مامری کێوی.
**grouse** (grous), *v.i.* [Slang]. سکاڵاکردن؛ بۆڵەبۆڵ کردن.
*n.* [Slang], (١) سکاڵا؛ بۆڵەبۆڵ.
(٢) کەسێکی هەمیشە سکاڵاکەر یا بۆڵەبۆڵکەر.
**grout** (grout), *n.* (١) خڵتە
(٢) گەچ، قوڕو قسڵ، یا چیمەنتۆیەکی شل کە درزی پێ پڕ دەکرێتەوە.
*v.t.* بە قوڕو قسڵ یا گەچ درز پڕ کردنەوە.
**grove** (grōv), *n.* باخ؛ کۆمەڵە درەختێك؛ دارستانێکی بچووك.
**grovel** (gruv′'l, grov′'l), *v.i.* (١) لەسەر دەمدا ڕاکشان یا خۆ دان بە زەویدا. (٢) کڕنووش بۆ بردن؛ دەستەوئەژنۆ وەستان؛ خۆ سووك کردن.
(٣) حەز لە خۆ سووك کردن
**-groveler; groveller** *(n.)*.
**grow** (grō), *v.i.* (١) ڕووان (ڕووەك)؛ چەکەرەکردن؛ پشکوتن.
(٢) پەروەردەبوون؛ ژیان؛ ڕووان؛ توانای ڕووان بوون.
(٣) گەورەبوون؛ نەشونماکردن؛ بە خۆدا هاتن؛ گەشەکردن.
(٤) زۆربوون؛ زیادکردن؛ فرەبوون.
(٥) بوون بە؛ وا لێهاتن *( He grew tired of his job.)* .
(٦) بوون بە یەك و پەیوەست بوون
*v.t.* (١) ڕوواندن؛ بەخێوکردن؛ چاندن؛ پەروەردەکردن؛ پێگەیاندن.
(٢) هێشتنەوە (سمێڵ، ڕیش). *( He tried to ~ a mustache.)* .
(٣) پەرە پێ سەندن؛ گەشەپێکردن.
**grow on,** پێ ڕاهاتن؛ وردە وردە بەدڵدا چوون
**grow out of,** (١) لێوەهاتن؛ لە سەرچاوەیەکەوە هاتن.
(٢) تاقەت لێ چوون.
**grow up,** (١) گەورەبوون؛ بە خۆدا هاتن. (٢) وا لێهاتن
**grower** (grō′ēr), *n.* کشتکەر؛ کشتوکاڵکەر؛ وەرزێر.
**growl** (groul), *v.i.* (١) مڕاندن (سەگ)؛ مڕەمڕکردن؛ مڕەمڕهاتن.
(٢) قۆڕاندن (سك)؛ لووراندن (ڕەشەبا). (٣) بۆڵەبۆڵ کردن.
(٤) گرمەهاتن (هەورەتریشقە، تۆپ).
*v.t.* بە بۆڵەبۆڵ کردن دەربڕین.
*n.* (١) مڕەمڕ؛ مڕە. (٢) قۆڕەقۆڕی سك. (٣) بۆڵە بۆڵ.
**grown** (grōn), *past participle of* **grow**.
*adj.* (١) هەراش؛ گەورە؛ پێگەیشتوو.
(٢) بە شێوەیەکی تایبەتی یا لە شوێنێکی تایبەتیدا هێنراوەتە بەرهەم:
*( home- ~ vegetables)*
**grown-up** (grōn′up′), *n.* کەسێکی هەراش یا گەورە
**grown-up** (grōn′up′), *adj.* هەراش؛ گەورە.
*n.* کەسێکی هەراش یا گەورە
**growth** (grōth), *n.* (١) گەورەبوون؛ نەشونماکردن؛ گەشەکردن.
(٢) (ا) زۆربوون؛ زیادبوون. (ب) چەندی ئەم زیادبوونە.
(٣) شتێکی ڕوواو: *( a thick ~ of grass)* .
(٤) زیادە گۆشت؛ دوومەڵ.
**grub** (grub), *v.i.* (١) زەوی هەڵکەندن؛ هەڵکەندن.
(٢) کاری ناخۆش و وشك کردن.
(٣) بۆ گەڕان.
*v.t.* (١) زەوی پاك کردنەوە لە ڕەگ. (٢) لە ڕەگ هەڵکێشان؛ لە ڕەگ دەرهێنان
(٣) [Slang]، خواردن پێدان.
*n.* (١) کرمۆکە (بەتایبەتی هی قالۆنچە).
(٢) کەسێك کە کارێکی ناخۆش و وشك دەکات.
(٣) [Slang]، خواردەمەنی.
**-grubber** *(n.)*.
**grubby** (grub′i), *adj.* (١) کرم یا کرمۆکە تێداو (ئاژەڵ).
(٢) پیس و پۆخڵ (جل و بەرگ)؛ شڕووڕ: *( ~ clothes)* .
**grudge** (gruj), *v.t.* (١) بەخیلی پێ بردن:
*( He ~s John his beautiful wife.)*
(٢) بە نابەدڵییەوە پێدان؛ پێ ڕانەبینین:
*( The miser ~ed his dog its food.)*
*n.* (١) کینە؛ ڕق؛ قین. (٢) هۆ یا بەڵگەی کینە.
**grudgingly** (gruj′iŋ-li), *adv.* بە نابەدڵییەوە.
**gruel** (grōō′əl), *n.* شۆربا.
*v.t.* سزادان؛ ماندووکردن بە لێپرسینەوە؛ چەوساندنەوە.
**grueling, gruelling** (grōō′əl-iŋ, grōō′liŋ), *adj.* — سەخت (کار، ئەرك، لێپرسینەوە)؛ قورس؛ زۆر ناخۆش (کار، لێپرسینەوە) *( ~ work)*
*n.* بەسەرهاتێکی سەخت و ناخۆش.
**gruesome** (grōō′səm), *adj.* ترسناك؛ جەرگبڕ؛ زۆر ناخۆش (دیمەن، کردار، شوێن... هتد): *( ~ scenes of torture and death)*
**gruff** (gruf), *adj.* (١) قسەڕەق؛ تووڕەوتڕۆ؛ تووڕە؛ کەرتڕ.
(٢) گڕ (دەنگ).
**-gruffy** *(adj.)*.
**grumble** (grum′b'l), *v.i.* (١) بۆڵەبۆڵ کردن؛ برتەوبۆڵەکردن.
(٢) گرمەهاتن (هەورەتریشقە).
*n.* (١) بۆڵەبۆڵ؛ برتەوبۆڵە. (٢) گرمە.
**-grumbler** *(n.)*; **grumbly** *(adj.)*.
**grumpish** (grum′pish), *adj.* = **grumpy**.
**grumpy** (grum′pi), *adj.* تەنگەجیکلانە؛ تووڕەوتڕۆ؛ لچ هەڵقورتاو.
**grunt** (grunt), *v.i. & v.t.* مرقەمرق کردن (وەك بەراز)؛ مرخەمرخ کردن؛ مرخاندن.
*n.* (١) مرقەمرق؛ مرخەمرخ؛ مرقە.
(٢) جۆرە ماسییەکە مرخە دەکات کە لە ئاو دەردەهێنرێت.
**guarantee** (gar′ən-tē′), *n.* (١) دەستەبەری؛ بەڵێنی دانەوەی قەرزی کەسێکی تر. (٢) سەنەد؛ کومپیالە. (٣) گەرەنتی؛ بەڵێن؛ پەیمان.
(٤) دەستەبەر. (٥) بەڵێن یا گەرەنتی وەرگر. (٦) مسۆگەری.
*v.t.* (١) پشتگیری کردن؛ دەستەبەری کردن؛ گەرەنتی کردن:
*( They ~ their products.)*
(٢) بەڵێندان.
**guarantor** (gar′ən-tēr, gar′ən-tôr′), *n.* دەستەبەر؛ کەفیل؛ بەڵێندەر.
**guaranty** (gar′ən-ti), *n.* (١) دەستەبەری.

(۲) گەرەنتی؛ بەڵێنی مسۆگەری (۳) سەنەد؛ کومپیالە.

***v.t.*** دەستەبەری کردن؛ بەڵێنی پشتگیری کردن دان؛ گەرەنتی دان.

**guard** (gärd), ***v.t.*** (۱) پاراستن؛ ئاگاداری کردن

(۲) پاسکردن؛ پاسەوانی کردن؛ بە دیارەوە بوون.

(۳) [Archaic]، لەگەڵدا چوون بۆ پاراستن.

***v.i.* ( ~ against ),** وریا بوون (لە شتێك یا کەسێك)؛ ئاگا لە خۆ بوون:

***( to ~ against infection)***

***n.*** (۱) پاسەوانی؛ پاراستن. (۲) وریایی؛ هوشیاری.

(۳) پاسەوان؛ پاسدار؛ دیدەوان؛ نۆبەتچی؛ یاساوڵ.

(٤) ئامێری پارێزەر (بۆ پاراستنی مەکینە یا بەکارهێنەرەکەی).

(٥) یاریکەری بەرگر (فوتبۆل، باسکە... هتد).

**mount guard,** دەست بە نۆبەی پاسەوانی کردن

**off (one's) guard,** ناوریا؛ ناهوشیار.

**on (one's) guard,** وریا؛ هۆشیار؛ بەئاگا.

**stand guard,** پاسەوانی کردن؛ چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن

**guarded** (gär'did), ***adj.*** (۱) پارێزراو

(۲) پاسەوانی کراو؛ چاودێری کراو؛ داپۆشراو.

(۳) لە سنوور نەچووە دەرەوە؛ بە ترسەوە: ***( a ~ speech)*** .

**guardhouse** (gärd'hous'), ***n.*** (۱) پاسەوانخانە؛ پاسدارخانە

(۲) گرتووخانەی سەربازو ئەفسەر.

**guardian** (gär'di-ən), ***n.*** (۱) پاسەوان؛ پاسدار؛ پارێزەر؛ پارێزکار؛ خەمخۆر (۲) پێ سپێردراوی منداڵێك یا کەسێك کە نەتوانێت کاروباری خۆی بەڕێوەببات؛ ئەستۆگر؛ لێپرسراو؛ خەمخۆر.

**-guardianship *(n.).***

**guard-rail** (gärd'rāl'), ***n.*** نەردە (بۆ پلیکانەو ڕێگە)

**guardsman** (gärdz'mən), ***n.*** (۱) پاسەوان؛ پاسدار

(۲) ئەندامی هێزی پاسدارانی میللی

**guava** (gwä'və), ***n.*** (۱) داری " گواڤە "

(۲) بەری ئەم دارە کە سەوزەو لە هەرمێ دەچێ، بەڵام بچووکترە دەخورێت یا دەکرێت بە مرەبا

**gubernatorial** (gōō'bẽr-nə-tôr'i-əl, gū'bẽr-nə-tō'ri-əl),

***adj.*** تایبەتی بە فەرمانڕەوای هەرێم یا ویلایەتێك و فەرمانگەکەی.

**guerdon** (gũr'd'n), ***n.*** [Poetic]. پاداشت؛ خەڵات

***v.t.*** [Poetic], پاداشت دانەوە؛ خەڵات کردن

**guerilla, guerrilla** (gə-ril'ə), ***n.*** (۱) شەڕی پارتیزانی؛ شۆڕشی پارتیزانی. (۲) پارتیزان

***adj.*** پارتیزانی

**guess** (ges), ***v.t. & v.i.*** (۱) هەڵهێنان (مەتەڵ)؛ گۆترەکاری کردن.

(۲) وازانین؛ وادانان؛ لا وابوون: ***( I ~ you can do it.)*** .

***n.*** هەڵهێنان (مەتەڵ، شتێکی نهێنی)؛ گۆترە؛ گۆترەکاری.

**guess-work** (ges'wũrk'), ***n.*** (۱) هەڵهێنان (مەتەڵ)

(۲) گۆترەکاری

**guest** (gest), ***n.*** (۱) میوان. (۲) میوانی ئوتێل.

(۳) میوانی یانە یا دەزگایەك کە خۆی تێیدا ئەندام نەبێت.

(٤) لاورگە (جانەوەر، گیاندار)؛ لاکوت.

***adj.*** (۱) بۆ میوان؛ تایبەتی بە میوان.

(۲) بە میوانی یا بانگ کردن کارەکات: ***( a ~ artist)*** .

***v.t.*** میوانداری کردن.

***v.i.*** میوانداری پێکردن.

**guest-house**(gest'hous') ***n.*** میوانخانە

**guest of honor,** میوانی بەڕێز

**guffaw** (gə-fô'), ***n.*** قاقای پێکەنین؛ تریقانەوە؛ تریق و هوڕ

***v.i.*** تریقانەوە؛ پێکەنین بە دەنگێکی بەرز؛ تریقەی پێکەنین هاتن.

**guidance** (gīd''ns), ***n.*** ڕابەری؛ ڕابەری کردن؛ ئامۆژگاری؛ ڕێنمایی؛ ڕێگە پیشاندان.

**guide** (gīd), ***v.t.*** (۱) ڕابەری کردن؛ ڕێگە نیشاندان؛ پێشڕەوی کردن.

(۲) ئاراستەکردن. (۳) فێرکردن؛ ڕاهێنان.

(٤) بەڕێوەبردن؛ حوکمڕانی کردن.

***v.i.*** بوون بە ڕابەر؛ ڕابەری کردن.

***n.*** (۱) ڕابەر؛ پێشڕەو؛ پێشەنگ.

(۲) چاوساغی گەشتکەران؛ ڕابەری گەشتکەران.

(۳) ڕێگە پیشاندەر (نیشانە).

(٤) ڕابەرنامەی گەشتکەران؛ ڕێبەری ڕێبوار.

(٥) ڕابەرنامە؛ پەرتووکی ڕابەر: ***( a ~ to mathematics)*** .

**guidebook** (gīd'book'), ***n.*** ڕابەرنامەی گەشتکەران

**guided missile,** مووشەکی ئاراستەکراو.

**guideline** (gīd'līn'), ***n.*** پەیڕەو؛ ڕابەرنامە.

**guidepost** (gīd'pōst'), ***n.*** دار یا ستوونی ڕێگە نیشاندەر (بۆ ڕێبواران)

**guild** (gild), ***n.*** یەکێتی (کرێکاران، فەرمانبەران، پیشەسازان)؛ جفات؛ نەقابە.

**guilder** (gil'dẽr), ***n.*** پارەی هۆڵەندەو نەمسا

**guildsman** (gildz'mən), ***n.*** ئەندامی یەکێتی یا نەقابەیەك.

**guile** (gīl), ***n.*** فروفێڵ؛ ساختە؛ ساختەبازی؛ مەکربازی؛ فێڵبازی؛ زۆڵێتی.

**guileful** (gīl'fəl), ***adj.*** فێڵباز؛ ساختەچی؛ مەکرباز؛ زۆڵ.

**guileless** (gīl'lis), ***adj.*** بێ فێڵ و تەڵەکە؛ سەرڕاست؛ ساویلکە؛ دڵپاك.

**guillotine** (gil'ə-tēn'), ***n.*** گیلۆتین؛ گیۆتین: ئامێری سەربڕینی تاوانباران کە لە فەرەنساوە داهاتووە.

**guilt** (gilt), ***n.*** (۱) تاوان؛ گوناە؛ سووچ؛ خەتا

(۲) هەست بە گوناهباری کردن؛ هەست بە بێ ویژدانی کردن.

**guiltless** (gilt'lis), ***adj.*** بێ تاوان؛ بێ گوناە؛ بێ سووچ؛ بێ خەتا.

**guilty** (gil'ti), ***adj.*** (۱) تاوانبار؛ گوناهبار؛ خەتابار؛ تاوانکار؛ بەتاوان.

(۲) هەست بە گوناهباری کەر؛ هەستکەر بە بێ ویژدانی: ***( ~ conscience)*** .

**-guiltily *(adv.)*; guiltiness *(n.).***

**guinea** (gin'i), ***n.*** (۱) جونەی: پارەیەکی ئینگلیزییە.

(۲) باڵندەیەکی ماڵییە لە مریشك دەچێ.

(۳) [Slang]. ئیتاڵی (لەڕووی سووکییەوە).

**guinea fowl,** باڵندەیەکی ماڵییە لە مریشك دەچێ.

**guinea hen,** = **guinea fowl.**

**guinea pig,** (۱) بەرازی گینی: گیاندارێکی بچووکە ئەوەندەی کەروێشکێکی ماڵی دەبێت لە توخمی مشکەکوێرەیە بۆ تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە لە تاقیگەدا بەکاردەهێنرێ.

(۲) کەسێك یا شتێك کە بۆ تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوە بەکاربهێنرێ.

**guise** (gīz), ***n.*** (۱) [Archaic] ، ڕەفتار؛ خووڕەووشت.

(۲) جل و بەرگ؛ جل (۳) ڕوو؛ ڕووخسار؛ شێوەی دەرەوە.

(٤) ڕووالەت؛ ڕووالەتی درۆ؛ پەردە:

***( Under the ~ of friendship he betrayed us.)***

***v.t.*** (۱) [Archaic] ، پۆشین یا جل لەبەرکردن بە شێوەیەکی تایبەتی

(۲) [British Dial.]. شاردنەوە؛ خۆ لێ گۆڕین؛ ڕووخسار گۆڕین

***v.i.*** [British Dial.], خۆ گۆڕین؛ دەماخ کردن

**guitar** (gi-tär'), ***n.*** گیتار: ئامێرێکی مۆسیقییە لە عوود دەچێ.

**guitarist** (gi-tär'ist), ***n.*** گیتارژەن؛ گیتار لێدەر

**gulf** (gulf), ***n.*** (۱) کەنداو. (۲) کەندەڵان؛ کەندر؛ کەندەڵانێکی قووڵ و پان.

(۳) جیاوازی (نێوان دوو کەس، بیروباوەڕ، کۆمەڵ، وڵات... هتد).

(٤) گێژاو؛ گەرداو.

***v.t.*** قووتدان؛ ماشینەوە؛ هەموو گرتنەوە.

**gull** (gul), ***n.*** باڵندەیەکی دەریایی قاچ تەنراوی پەڕ سپی و ڕەش و بۆرە ئەوەندەی مراوییەك دەبێت (هەروەها " sea gull " ) .

**gull** (gul), ***n.*** کەسێکی ساویلکە؛ کەسێکی خۆشباوەڕی بە ئاسانی

هەڵخەڵەتێنراو

*v.t.* هەڵخەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن

**gullet** (gul'it), *n.* (١) سورێنچکە؛ سورێنچك
(٢) قورگ؛ مل
(٣) جۆگەی ئاو؛ چەم؛ کەلێ

**gullibility** (gul´ə-bil'ə-ti), *n.* ساویلکەیی؛ خۆشباوەڕی؛ بەسزمانی

**gullible** (gul'ə-b'l), *adj.* ساویلکە؛ خۆشباوەڕ؛ بەسزمان.

-gullibly *(adv.).*

**gully** (gul'i), *n.* کەلێ؛ چەم.

**gulp** (gulp), *v.t.* (١) هەڵ لووشین (خواردنەوە)؛ هەڵقوڕاندن بە پەلەو چاوبرسی‌یانە *(~ down coffee).*
(٢) گریان هاتن و وەستاندنی (کە وەك تف قووتدان دیارە).

*v.i.* هەناسە وەستان (هەر وەك لە کاتی هەڵقوڕاندنی قومێکی زلدا).

*n.* (١) هەڵقوڕاندن بە پەلە؛ هەڵ لووشین. (٢) قومێکی زل.

**gum** (gum), *n.* (١) گەوەن؛ جەوی؛ سرێش. (٢) لاستیك.
(٣) بنێشت؛ جاجك.

*v.t.* (١) جەوی دەردان؛ گەوەن دەردان. (٢) لینج بوون؛ لیقن بوون.

**gum** (gum), *n.* پووك.

**gumbo** (gum'bō), *n.* (١) داری بامێ؛ ڕووەکی بامێ. (٢) بامێ.
(٣) شلەی بامێ. (٤) شۆربا یا شلەی ماسی
(٥) جۆرە خاکێکی خواروو ڕۆژئاوای ئەمەریکایە کە تەڕ بوو لینج دەبێت.
(٦) زمانی فەرەنسی تولەڕەشەکانی ویلایەتی "لویزیانا" ی خوارووی ئەمەریکاو ئیندیزی ڕۆژئاوا

**gumption** (gump'shən), *n.* (١) [Colloq.]: زیرەکی (لە کاروباری ژیاندا)؛ زۆرزانی؛ زرنگی. (٢) گیانی دەستپێشکەری کردن و چاونەترسان؛ کۆشش کردن و چاوقایمی و کۆڵ نەدان.

**gun** (gun), *n.* (١) تفەنگ؛ دەمانچە؛ چەك؛ تۆپ
(٢) تەقەی چەکێك بۆ دەستپێکردن یا دوایی هاتنی پێشبڕکێ یا ملەملانێیەك.
(٣) ئامێرێك کە لە شێوەو بەکارهێناندا لە تفەنگ بچێت.
(٤) [Slang]: دەمەوانەی مەکینەیەك.

*v.t.* (١) [Colloq.]، تەقەلێکردن؛ کوشتن.
(٢) [Slang]: جووڵاندنی دەمەوانەی مەکینەیەك بۆ خێراترکردنی.

**big gun,** (١) کەسێکی گرنگ و بەدەسەڵات؛ کەسێکی دەست ڕۆیشتوو
(٢) ئەفسەرێکی گەورە

**stick to one's guns,** خۆ ڕاگرتن بەرامبەر بە هێرش؛ نەکشانەوە؛ هەڵوێست یا ڕێبازی خۆ نەگۆڕین.

**gun-boat** (gun'bōt´), *n.* بەلەمی چەکداری پاسەوانی.

**gunboat diplomacy,** دیبلۆماسی‌یەتی هەڕەشەو زۆرەملێ.

**gun-fire** (gun'fīr´), *n.* تەقەی تفەنگ؛ تفەنگ تەقاندن؛ تەقە تفەنگ.

**gung ho,** زۆر بەجۆش (بۆ کردنی شتێك، هەڵوێستێك، بۆ کەسێك)؛ بەپەرۆش: *(He is ~ on working for world peace.)*

**gunlock** (gun'lôk´), *n.* چەخماخ (تفەنگ).

**gunman** (gun'mən), *n.* (١) تفەنگچی بەتایبەتی تارانبارێك؛ تفەنگ لە شان؛ پیاوخراپێکی چەك لە شان. (٢) تفەنگ دروستکەر.

**gunner** (gun'ēr), *n.* (١) سەربازی تۆپ تەقێن.
(٢) ئەفسەری نێردراوی تۆپ و کەشتی‌یەکی جەنگی
(٣) ڕاوچی

**gunnery** (gun'ēr-i), *n.* (١) تۆپ؛ تۆپی گەورە
(٢) تۆپی گەورە دروستکردن و تەقاندن.
(٣) تۆپ تەقاندن.

**gunny** (gun'i), *n.* (١) ئەو قوماشەی گونیەی لێ دروست دەکرێت.
(٢) گونیە؛ خەرار

**gunny sack,** گونیە؛ خەرار

**gun-powder** (gun'pou´dēr), *n.* باروت.

**gun-runner** (gun'run´ēr), *n.* قاچاخچی تفەنگ و چەکی تر.

**gun-shot** (gun'shot´), *n.* (١) گوللە؛ تەقەی تفەنگ؛ تەقە.
(٢) [Rare]، تفەنگ تەقاندن. (٣) مەودای بڕکردنی گوللەیەك.

*adj.* تایبەتی بە گوللە: *(a ~ wound).*

**gun-shy** (gun'shī´), *adj.* لە تەقەی تفەنگ ترساو: *(a ~ dog).*

**gunsmith** (gun'smith´), *n.* تفەنگساز؛ چەکساز؛ وەستای تفەنگ و دەمانچە.

**guppy** (gup'i), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگە بۆ جوانی بەخێو دەکرێت.

**gurgle** (gũr'g'l), *v.i.* بلقەبلق کردن (وەك ئاوی شەربە یا شووشە)؛ قلپەهاتن؛ خوڕەهاتن

*n.* بلقەبلقی ئاو؛ خوڕەی ئاو یا دەنگێکی وەها.

**gush** (gush), *v.i.* (١) فیچقەکردن (خوێن، ئاو، فرمێسك)؛ لێ هاتنەدەرەوە بەخوڕ. (٢) [Colloq.]، نووسین یا دووان بە جۆشەوە

*n.* (١) فیچقە؛ فیچقەکردن؛ پژان.
(٢) [Colloq.]، پیشاندانی هەست یا جۆشی لە ڕادە بەدەر.

**gushy** (gush'i), *adj.* هەست پیشاندەر بە ئاشکراو لە ڕادە بەدەر.

**gusset** (gus'it), *n.* تیرۆژ؛ خشتەك.

**gust** (gust), *n.* (١) بایەکی قایم کە لەپڕ هەڵدەکات؛ ڕەشەبا.
(٢) باران، دووکەڵ، ئاگر، یا دەنگێکی لەپڕو بەتین.
(٣) هەڵچوونێك، تووڕەبوونێك، یا پێکەنینێکی لەپڕ.

**gust** (gust), *v.t.* [Scot.], تام کردن؛ حەزلێکردن.

**gustation** (gus-tā'shən), *n.* (١) تام کردن. (٢) هەستی تام کردن.

**gusto** (gus'tō), *n.* (١) حەز؛ مەیل.
(٢) زۆر حەزلێکردن؛ زۆر بەدڵ بوون؛ زۆر بە حەزەوە.
(٣) جۆش: *(to do something with ~).*

**gusty** (gus'ti), *adj.* قایم (با): *(~ winds).*

**gut** (gut), *n.* (١) *(pl.)*، هەناو. (٢) ڕیخۆڵە.
(٣) ژێ (کە دروست دەکرێت لە ڕیخۆڵەی هەندێ گیانداری وەك پشیلە بۆ کەمانچەو دوورینەوەی برین). (٤) قۆزاخەی ئاوریشم.
(٥) ڕێڕەوێکی تەسك؛ گەلێ.
(٦) *(pl.)*، [Slang]، (ا) غیرەت؛ ئازایی؛ چاونەترساوی؛ بەجەرگی.
(ب) بێ حەیایی؛ چەقاوەسوویی؛ بێ شەرمی. (ج) هێز؛ کاریگەری.

*v.t.* (١) هەناو دەرهێنان.
(٢) ناوەوەی وێرانکردن وەك بە ئاگر: *(Fire ~ted the building.)*

**gutless** (gut'lis), *adj.* بێ غیرەت؛ ترسنۆك؛ کوونی

-gutlessness *(n.).*

**gutsy** (gut'si), *adj.* [Slang], بەغیرەت؛ ئازا؛ بەجەرگ.

-gutsiness *(n.).*

**gutter** (gut'ēr), *n.* (١) ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕۆگە؛ زێراب.
(٢) باری ژیانێکی پڕ لە نەبوونی و بێ دەرامەتی و پیس و پۆخڵی و ڕەشوڕووتی.

*v.t.* زێراب یا ئاوەڕۆگە بۆ دروستکردن.

*v.i.* (١) بە جۆگەدا ڕۆیشتن. (٢) توانەوە (مۆم).

**gutteral** (gut'ēr-'l), *adj.* (١) قورگی؛ تایبەتی بە قورگ
(٢) بە قورگ دەوترێ (دەنگ).
(٣) پڕ لە دەنگی لە قورگدا پەیدابوو یا بە قورگ ووتراو:
*(Arabic is a ~ language.)*

*n.* (١) دەنگێك کە لە قورگەوە دێت یا پەیدا دەبێت (وەك دەنگی تیپی: ح، خ، ع، غ). (٢) نیشانەی ئەم جۆرە دەنگە.

**guy** (gī), *n.* گوریس، زنجیر، یا دارێك کە بۆ چەسپاندن یا ڕاگیرکردنی شتێك بەکاردەهێنرێت.

**guy** (gī), *n.* (١) کەسێکی سەیر لە ڕووخسار یا جل‌وبەرگیدا.
(٢) [Slang]، کوڕ؛ پیاو؛ کابرا؛ زەلام.

*v.t.* [Colloq.], گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.

**guzzle** (guz'l), *v.i. & v.t.* زۆر خواردنەوە.

**gym** (jim), *n.* (١) **gymnasium** .
(٢) کۆرسێکی جیمناستیك یا وەرزش لە قوتابخانە یا کۆلیجدا.
**gymnasium** (jim-nā′zi-əm), *n.* (١) جیمنازیۆم: خانوو یا هۆلی یاری جیمناستیك یا وەرزش کردن؛ یاریگای سەرگیراو؛ وەرزشگا (تەنافبازی).
(٢) [G-]: قوتابییەکی قوتابخانەی ناوەندی ئەڵمانی و هەندێ وڵاتانی ئەورووپی تر کە ئامادە دەکرێت بۆ چوونە زانکۆ
**gymnast** (jim′nast), *n.* تەنافباز: یاریکەری جیمناستیك.
**gymnastic** (jim-nas′tik), *adj.* وەرزشی: تایبەتی بە وەرزش.
**gymnastics** (jim-nas′tiks), *n.pl.* تەنافبازی؛ یاری جیمناستیك.
**gyneco-** (jī′ni-kō, jin′i-kō), پێشگرێکە بەمانای: هی ژنان؛ تایبەتی بە ژن
**gynecologist** (gī′ni-kol′ə-jist, jī′ni-kol′ə-jist), *n.* پزیشکی ژنان؛ پزیشکی نەخۆشی ژنان (بەتایبەتی هی ئەندامی زاووزێ).
**gynecology** (gī′ni-kol′ə-ji, jī′ni-kol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی نەخۆشی ژنان (بەتایبەتی هی ئەندامی زاووزێ).
-gynecologic *(adj.)*; gynecological *(adj.)*.
**gynephobia** (jī′ni-fō′bi-ə, jin′i-fō′bi-ə), *n.* لە ژن ترسان
**gyno-** (jī′nō, jin′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) ژن؛ مێ.
(٢) ئەندامی زاووزێی ژن.
**gyp** (jip), *n.* [Slang], (١) ساختە؛ فێڵ و تەڵەکە؛ فێڵ.
(٢) ساختەچی: کەسێکی ساختەچی یا تەڵەکەباز
*v.t. & v.i.* [Slang], ساختەلێکردن؛ هەڵخەڵەتاندن.
**gypsum** (jip′səm), *n.* گەچ
**gypsy, gipsy** (jip′si), *n.* (١) قەرەج
(٢) [G-]. زمانی قەرەجەکان. (٣) کەسێك کە لە قەرەج دەچێت.
*adj.* وەك قەرەج؛ قەرەجانە؛ تایبەتی بە قەرەج.
*v.i.* وەك قەرەج ژیان، واتە ژیانی گەڕۆکی
**gyrate** (jī′rāt, jī-rāt′), *v.i.* خولانەوە بە دەوری خۆدا (گێژاو، مەکینە، گەردەلوول)
*adj.* پێچاوپێچ: پێچ لوول
-gyration *(n.)*; gyrator *(n.)*.
**gyre** (jīr), *n.* (١) خولانەوە بە دەوری خۆدا؛ خولانەوە
(٢) بازنە: ئەڵقە؛ شتێکی پێچ لوول
**gyve** (jīv), *n.* [Archaic]. پێوەند: پێوەن
*v.t.* پێوەندکردن.

# H h

**H, h** (āch), *n.* (١) تیپی هەشتەمی ئەلفوبێی ئینگلیزی.
(٢) دەنگی ئەم تیپە. (٣) هەشتەمین شت لە ڕیزێکدا.
*adj.* (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) هەشتەمین.
**H, h** (āch), *n.* (١) شتێک کە شێوەی لەم تیپە بکات.
(٢) ژمارەی ڕۆمانی بۆ (٢٠٠).
**ha** (hä), *interj.* ها!؛ ئەها! دەنگێکە سەرسامی، گومان، تووڕەیی، خۆشی، یا ناخۆشی دەردەبڕێت).
**habeas corpus** (hā'bi-əs kôr'pəs), فەرمانی دادگا بە هێنانی بەندێک یا گیراوێک بۆ دادگا تاکو بڕیار بدرێت ئایا بەند کردنی یا گرتنی ڕەوایە یان نا.
**haberdasher** (hab'ēr-dash'ēr), *n.* (١) فرۆشیاری شتومەکی پیاوان :وەک کراس، بۆینباخ، دەستەسڕ، دەسکێش، کڵاو... هتد).
(٢) وردەفرۆش (وەک دەرزی و دەزوو و قۆپچە... هتد).
**haberdashery** (hab'ēr-dash'ēr-i), *n.* (١) وردە شت.
(٢) دووکانی وردەفرۆشی.
**habiliment** (hə-bil'ə-mənt), *n.* (١) پارچەیەک جل.
(٢) (*pl.*) جل و بەرگ.
**habilitate** (hə-bil'ə-tāt'), *v.t.* (١) پۆشتەکردنەوە: پۆشین؛ جل لەبەرکردن. (٢) ئازووقەو پارە دان بە کانگایەک.
**-habilitation** *(n.).*
**habit** (hab'it), *n.* (١) جل و بەرگ؛ جل
(٢) جل و بەرگێکی تایبەتی (وەک هی مەلا یا سواری وڵاخ بۆ ژن):
*( a monk's ~ ; a woman's riding ~ )*
(٣) خوو؛ نەریت؛ پیشە؛ عادەت.
(٤) هۆگری بە شتێکەوە گرتن و واز لێ نەهێنانی: *( the alcohol ~ )* .
(٥) شێوەی تایبەتی گەورەبوونی ڕووەک یا گیاندارێک.
*v.t.* (١) جل لەبەرکردن؛ جلی تایبەتی لەبەرکردن؛ پۆشین.
(٢) [Archaic]، تێدا ژیان؛ نیشتەجێ بوون تێیدا.
**habitable** (hab'i-tə-b'l), *adj.* بەکاری تێدا ژیان دێت؛ بۆ تێیدا ژیان دەشێت.
**habitat** (hab'ə-tāt'), *n.* (١) شوێنی سروشتی گیاندارێک یا ڕووەکێک؛ ئەو شوێنەی کە گیاندارێک یا ڕووەکێک بەزۆری تێیدا دەژی یا دەبینرێت؛ نیشتەجێی گیاندار یا ڕووەک؛ دەوروبەری سروشتی گیاندار یا ڕووەک (٢) هەوارگا؛ نیشتەجێی مرۆڤێک یا شتێک.
**habitation** (hab'ə-tā'shən), *n.* (١) تێدا ژیان؛ ژیان؛ ژین.
(٢) ماڵ؛ هەوارگا؛ نیشتەجێ؛ خانوو.
**habitual** (hə-bich'ōō-əl), *adj.* (١) خوو؛ بووە بە خوو.
(٢) هەمیشەیی؛ بەردەوام؛ هۆگری پێوەگرتوو: *( a ~ smoker )* .
(٣) باو.
**habitually** (hə-bich'ōō-əl-i, hə-bich'oo-li), *adv.* هەمیشە؛ جار لەدوای جار؛ بە خوو؛ عادەتەن.
**habituate** (hə-bich'ōō-āt'), *v.t.* (١) ڕاهێنان؛ ڕاهاتن؛ خۆ ڕاهێنان؛ فێربوون؛ فێرکردن.
(٢) [Colloq.]، زۆر چوونە شوێنێک؛ زوو زوو سەردان لە شوێنێک.
-habituation *(n.).*
**habitude** (hab'ə-tōōd', hab'i-tūd'), *n.* (١) سرووشت؛ جۆری هەڵسان و دانیشتن. (٢) باو؛ خوو.
**habitué** (hə-bich'ōō-ā', hə-bich'ōō-ā'), *n.* کەسێکە کە زوو زوو دەچێتە چێشتخانە، یانە، یا تیاترۆیەک.
**hacienda** (hä'si-en'də), *n.* کێڵگە یا خانوویەکی گەورەو زەوی و زاری دەورەکەی لە لادێ.
**hack** (hak), *v.t.* (١) داپاچین؛ لەت کردن یا بڕینەوە (بە تەشوێ یا تەور). (٢) زەوی هەڵکەندن و تەخت کردن (بە قوڵنگەو خاکەناز).
(٣) شەق لە لوولاق دان (یاری فوتبۆڵێن).
*v.i.* (١) بڕین بە شێوەیەکی نەزانانە. (٢) کۆکین.
*n.* (١) ئامێری داپاچین یا هەڵکەندن (تەور، تەشوێ، قوڵنگ، خاکەناز)
(٢) تلیش یا قلیشێک کە بە تیغێکی تیژ دەکرێتە شتێک. (٣) کۆکە.
(٤) ڕووشان یا بڕینی لوولاق لە ئەنجامی شەق تێ هەڵداندا (یاری فوتبۆڵێن).
**hack** (hak), *n.* (١) ئەسپی کرێ؛ ئەسپی عەرەبانە. (٢) بارگیر.
(٣) ئەسپی سواری. (٤) ئەسپێکی پیری بێ کارە.
(٥) نووسەرێکی بەکرێ گیراو (بەتایبەتی بۆ نووسینی شتی ووشک و ناخۆش).
(٦) عەرەبانەی کرێ. (٧) تەکسی. (٨) عەرەبانچی.
*v.t.* (١) بە کرێ گرتن بۆ نووسینی شتی ووشک و ناخۆش.
(٢) بە کرێ دان (ئەسپ). (٣) سواندن؛ سوان.
*v.i.* (١) سواربوونی ئەسپی کرێ.
(٢) [Colloq.]، تەکسی لێخوڕین.
*adj.* (١) بە کرێ گیراو بۆ نووسینی شتی ووشک و بێ تام:
*( a ~ writer)*
(٢) سوواو؛ کۆن و پەڕپووت (ووتە، زاراوە)؛ پەڕپووت؛ هیچ و پووچ.
**hack** (hak), *n.* (١) چوارچێوەیەکی بە تەل یا شیش تەنراو (بۆ لەسەر هەڵخستنی پەنیر و ماسی یا بۆ ئاخوڕی ڕەشەوڵاخ).
(٢) ڕیزە خشتێکی کاڵ کە لەبەر هەتاو دادەنرێن بۆ ووشک بوونەوە
*v.t.* خستنە سەر چوارچێوەیەک بۆ ووشک بوونەوە.
**hackle** (hak''l), *n.* (١) پەڕی ملی کەڵەشێر و کۆتر و تاووس.
(٢) پەڕی ملی کەڵەشێر کە دەکرێت بە کلکی مێشێکی دەستکردەوە بۆ ڕاوەماسی. (٣) (*pl.*)، تووکی مل و پشتی سەگ کە ڕاست دەبێتەوە لە کاتی مەترسیدا.
**hackman** (hak'mən), *n.* عەرەبانچی.
**hackney** (hak'ni), *n.* (١) ئەسپی کرێ؛ ئەسپی سواری.
(٢) عەرەبانەی کرێ. (٣) کرێکارێکە کە ئیشی ووشک و ناخۆشی دەدرێت بەسەردا.
*adj.* (١) بە کرێ گیراو. (٢) سوواو؛ پەڕپووت؛ کۆن و بێ تام و بێ مانا؛ هیچ و پووچ.
*v.t.* (١) بەکرێدان. (٢) سواندن؛ سوان؛ لە کەڵک خستن بە بەکارهێنانی زۆر.
**hackneyed** (hak'nid), *adj.* سوواو (ووتە، زاراوە)؛ پەڕپووت؛ کۆن و بێ تام: *( a ~ phrase )*
**hack-saw** (hak'sô'), *n.* = **a hack saw.**
**hack saw,** مشاری ئاسنبڕ
**had** (had), *past tense and p.p. of* **have.**
**haddock** (had'ək), *n.* جۆرە ماسییەکی بچووکی دەریاییە.

**Hades** (hā′dēz), *n.* (١) (ا) ئارامگای گیانی مردووان (ئەفسانەی یۆنانی، ئینجیل) (ب) فەرمانڕەوای ئەم ئارامگایە.
(٢) [h-]، [Colloq.]، دۆزەخ؛ جەهەننەم.

**hadj** (haj), *n.* حەج؛ حەج کردن.

**hadji** (haj′ē), *n.* حاجی

**hadn't** (had′'nt), = **had not.**

**haemo-** (hē′mə, hem′ə), = **hemo-.**

**haemoglobin** (hē′mə-glō′bin, hem′ə-glō′bin), *n.* = **hemoglobin.**

**haemophilia** (hē′mə-fil′i-ə, hem′ə-fil′yə), *n.* = **hemophilia.**

**haft** (haft, häft), *n.* مشتو (چەقۆ، شیر).

**hag** (hag), *n.* (١) دێوودرنجی مێ؛ مێ جنۆکە.
(٢) جادوگەری ژن (٣) پیرێژنێکی ناپەسەندو ناشرین. (٤) جۆرە ماسییەکە.

**hag** (hag), *v.t.* داپاچین؛ برین؛ لەتکردن.

*n.* (١) (ا) داروودرەخت برینەوە؛ دار داپاچین.
(ب) بەشی دارستانێك کە بۆ برینەوە دانراوە. (ج) دارو درەختی بڕاوە.
(٢) زۆنگاو؛ بەشێکی پتەوی زەلکاو.

**haggard** (hag′ērd), *adj.* (١) هەلۆیەکی بە هەراشی گیراو.
(٢) کێوی؛ مالی نەکراو؛ دابین نەکراو.
(٣) ڕەنگ زەردولاوازو ماندوو قوپاو: *( a ~ face, look, etc.)*.

*n.* هەلۆیەکی بە هەراشی گیراو.

**haggle** (hag′'l), *v.t.* برین یا لەتکردن بە شێوەیەکی نەزانانە.

*v.i.* سەوداکردن؛ مشتومڕکردن (لەسەر نرخ و سەودا).

*n.* سەودا؛ سەوداکردن؛ مشتومڕ (لەسەر نرخ و سەودا).

**hagiarchy** (hag′i-är′ki, hā′ji-är′ki), *n.* فەرمانڕەوایی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان.

**hagi-, hagio-** (hag′i-ō, hā′ji-ō), پێشگرێکە بەمانای پیرۆز.

**hagiocracy** (hag′i-ok′rə-si, hā′ji-ok′rə-si), *n.* فەرمانڕەوایی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان.

**hagiography** (hag′i-og′rə-fi), *n.* (١) لێکۆڵینەوەی ژیاننامەی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان. (٢) پەڕتووکێکی ئەم جۆرە ژیاننامانە.

**-hagiographer** *(n.)*; **hagiographist** *(n.)*.

**hagiology** (hag′i-ol′ə-ji, hā′ji-ol′ə-ji), *n.* (١) وێژەی ژیانی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان و نوسینەکانیان. (٢) پەڕتووکێکی ژیان و نوسینی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان. (٣) لیستەی پیاوە ئاینییە پیرۆزەکان.

**haiku** (hī′kōō), *n.* جۆرە هەڵبەستێکی یابانییە لە سێ دێڕ پێکدێت و حەڤدە بڕگەیە

**hail** (hāl), *v.t.* (١) سڵاولێکردن یا بەخێرهاتن کردن بە دەنگێکی بەرز.
(٢) ناونان. *( They ~ed him their leader.)*.
(٣) بانگ کردن: *( They ~ed a taxi.)*.

*n.* (١) سڵاو یا بەخێرهاتن کردن بە دەنگێکی بەرز؛ سڵاو.
(٢) ماوەی بڕکردنی هاوارێك: *( He is within ~ )*.

*interj.* سڵاوت لێ بێ!؛ بەخێربێن!.

**hail from,** نیشتەجێ یا خەڵکی شوێنێك بوون.
*( I hail from Karadagh.)*

**hail** (hāl), *n.* (١) تەرزە.
(٢) بارین (تەرزە، ئاگر، تەقەمەنی): *( a ~ of explosives)*.

*v.i.* تەرزە بارین.

*v.t.* ( ~ **on**; ~ **upon** ), بەسەردا بارانن؛ تێگرتن؛ دانەبەر (جوێن، بەرد، گوللە): *( He ~ed curses upon us.)*.

**hailstone** (hāl′stōn′), *n.* دەنکە تەرزە؛ تەرزە

**hailstorm** (hāl′stôrm′), *n.* باوبۆرانێکی تەرزە.

**hair** (hâr), *n.* (١) قژ؛ تووك؛ موو؛ قژی سەر؛ تیسك؛ پرچ؛ ئەگریجە؛ زولف. (٢) قوماش یا تەنراوی تووك.
(٣) زۆر کەم (ماوە، پلە، جیاوازی): *( He missed the target by a ~ )*.

**get in one's hair,** [Slang], پەستکردن؛ زیزکردن.

**let one's hair down,** [Slang], بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن؛ شەرم نەکردن.

**make one's hair stand on end,** ترساندن؛ تۆقاندن

**not turn a hair,** خۆ نەشڵەژاندن؛ نەشڵەژان.

**split hairs,** مشتومڕکردن لەسەر شتی هیچ‌وپووچ.

**to a hair,** بە تەواوی؛ بەبێ کەم و زیاد؛ هەمووی ڕاستە.

**hair-breadth** (hâr′bredth), *n.* ماوەیەکی کورت یا تەسك؛ ئەوەندەی موویەك؛ زۆر کەم.

*adj.* بە ئاستەم؛ بە حاڵ.
*( a ~ escape )*

**hair-brush** (hâr′brush′), *n.* فڵچەی سەرداهێنان.

**hair-cut** (hâr′kut′), *n.* سەرتاشین.

**hair-do** (hâr′dōō′), *n.* قژ چاك کردن و ڕێك‌وپێك کردنی ژنان؛ ئارایشتی قژی ئافرەت.

**hairdresser** (hâr′dres′ēr), *n.* دەلاکی ژنان؛ سەرتاشی ژنان

**hairdressing** (hâr′dres′iŋ), *n.* (١) پیشەی دەلاك یا سەرتاش؛ دەلاکی. (٢) قژ چاك کردن و ئارایشت کردن. (٣) دەرمانی ئارایشت کردنی قژ.

*adj.* تایبەتی بە چاك کردن و ئارایشت کردنی قژ.

**hairless** (hâr′lis), *adj.* سەرڕووتاوە؛ بێ قژ؛ بێ موو

**hairline** (hâr′līn′), *n.* (١) گوریس؛ پەتی موو. (٢) هێڵی بارێك.
(٣) قوماشی هێڵدار. (٤) سنووری قژی ناوچەوان.

**hair-piece** (hâr′pēs′), *n.* باروکە.

**hairpin** (hâr′pin′), *n.* تەوقەی سەر.

*adj.* زۆر شکاوە (پێچ)؛ سەخت یا تیژ (پێچ، لوف).
*( a ~ curve in the road)*

**hair-raising** (hâr′rāz′iŋ), *adj.* [Colloq.], جەرگبڕ؛ ترسناك؛ ناخۆش.

**hair-spliting** (hâr′split′iŋ), *n. & adj.* مشتومڕکردن لەسەر شتی هیچ‌وپووچ.

**-hair-spliter** *(n.)*.

**hair-spring** (hâr′spriŋ′), *n.* زەمبەلەکی کاتژمێر (کە وەك موو وایە).

**hair trigger,** پەلەپیتکەیەك کە بە ئاستەم پەنجەی بەربکەوێت چەکەکە دەتەقێنێت.

**hairy** (hâr′i), *adj.* تووکن؛ تووکاوی؛ تیسکن.

**-hairiness** *(n.)*.

**haji, hajji** (haj′ē), *n.* حاجی.

**halberd** (hal′bērd), *n. Also* **halbert,** چەکێکی کلك درێژە لە ڕم و تەوری شەڕ پێکهاتووە.

**halcyon** (hal′si-ən), *n.* (١) باڵندەیەکە بەپێی ئەفسانە شەپۆل و بای دەریای هێمن کردۆتەوە لەکاتی کڕکەوتنیدا لەسەر دەریا لە چلەی زستاندا.
(٢) باڵندەیەکی پۆپنەدارە.

*adj.* (١) تایبەتی بەم باڵندە پۆپنەدارە
(٢) هێمن؛ خۆش؛ پڕ کامەرانی: *( ~ days )*.

**hale** (hāl), *adj.* تەندرووست (بەتایبەتی کەسێکی بەتەمەن).

**hale** (hāl), *v.t.* (١) بەزۆر ڕاکێشان.
(٢) بەزۆر بردنی کەسێك بۆ شوێنێك.

**half** (haf, häf), *n.* نیو؛ نیوە؛ نیمە.

*adj.* (١) نیو؛ نیوە؛ نیمە (٢) ناتەواو؛ بەش بەش؛ کەرت؛ لەت؛ نیمچە.

*adv.* (١) نیو؛ نیوە.
(٢) [Colloq.]، نیمچە؛ تا ڕادەیەك: *( I was ~ convinced)*.
(٣) بە هیچ جۆرێك؛ قەت: *( He doesn't ~ approve.)*.

**by half,** زۆر؛ ئێجگار زۆر.

**in half,** بە دوو بەشەوە؛ نیواو نیو؛ وەکو یەك.

**not half bad,** باش

**one's better half,** [Slang]. هاوسەر (ژن یا مێرد)؛ ژنی کەسێک؛ مێردی کەسێک

**half-and-half** (haf′'nd-haf′, häf′'n-häf′), *n.* شتێکی نیواو نیو بەتایبەتی (ا) شیری چەور. (ب) خواردنەوەیەکی تێکەڵاو.

*adj. & adv.* نیواونیو؛ لە دوو شتی ئەوەندەی یەک پێکهاتوو.

**half-baked** (haf′bākt′, häf′bākt′), *adj.* (١) باش نەبرژاو؛ پێ نەگەییو؛ ناکام. (٢) باش لێ نەکۆڵراوە؛ باش ئامادە نەکراو؛ بەووردی نەکراو؛ نیوەوناتەواو: *( a ~ scheme)*. (٣) نەشارەزا؛ نەزان؛ بێ مێشک.

**half-blood** (haf′blud′, häf′blud′), *n.* (١) زڕبرا؛ زڕخوشک. (٢) کەسێکی دوورەگ.

**-half-blooded** *(adj.).*

**half-breed** (haf′brēd′, häf′brēd′), *n.* کەسێکی دوورەگ (بەتایبەتی منداڵی کەسێکی سپی و هیندییەکی ئەمەریکی).

*adj.* دوورەگ.

**half brother,** زڕبرا

**half-caste** (haf′kast′, häf′käst′), *n.* کەسێکی دوورەگ.

*adj.* دوورەگ

**half-hearted** (haf′här′tid, häf′här′tid), *adj.* نیوە نابەدڵ؛ لووتەلا *( a ~ attempt at painting.)*.

**half-heartedly** (haf′här′tid-li), *adv.* بە نیوەبەدڵییەوە؛ بە لووتەلاوە

**half-hour** (haf′our′, häf′our′), *n.* نیو سەعات؛ سی خولەک.

*adj.* (١) نیو سەعاتی؛ نیو سەعات دەخایەنێت. (٢) هەموو نیو سەعاتێک؛ نیو سەعاتانە ڕوودەدات.

**half-hourly** (haf′our′li, häf′our′li), *adj. & adv.* هەموو نیو سەعاتێک؛ نیو سەعاتانە ڕوودەدات.

**half-length** (haf′leŋkth′, häf′leŋth′), *adj.* (١) نیوەی درێژی یا کاتی ئاسایی (٢) هی ناوقەد بەرەو ژوور (وێنە).

*n.* وێنەی لەناوقەد بەرەو ژوور

**half-mast** (haf′mast′, häf′mäst′), *n.* هێنانەخوارەوەی ئاڵا بۆ ناوەڕاستی دارئاڵادا (نیشانەی شین و کارەسات).

*adv.* لە ناوەڕاستی دارئاڵادا.

*v.t.* شۆڕکردنەوەی ئاڵایەک بۆ ناوەڕاستی دارئاڵاکە.

**half-moon** (haf′mōōn′, häf′mōōn′), *n.* شێوەی مانگ لە بەینی یەک شەوە و چواردە شەوەدا. (٢) شتێک کە شێوەی وابێ.

**half-penny** (hā′pən-i, hāp′ni), *n.* نیو فلس (پارەی ئینگلیزی).

*adj.* (١) نیو فلس دێنێت. (٢) بێ نرخ؛ هیچ و پووچ.

**half sister,** زڕخوشک.

**half-staff** (haf′staf′, häf′stäf′), *n.* = **half-mast.**

**half title,** ناو یا ناونیشانی ناوەوەی پەڕتووکێک.

**half-truth** (haf′trōōth′, häf′trōōth′), *n.* نیوە ڕاست و نیوە درۆ.

**half-way** (haf′wā′, häf′wā′), *adj.* (١) نیوەڕێ؛ ناوەڕاست؛ نیوەی ڕێگە (٢) ناتەواو؛ نیوەوناتەواو: *( ~ measures)*.

*adv.* (١) نیوەی ڕێ. (٢) بە نیوە و ناتەواوی. (٣) [Colloq.]، نەختێک؛ تۆزێک: *( He'd win if he were ~ good.)*.

**meet halfway,** وازهێنان لە هەندێک مافی خۆ لەپێناوی ڕێکەوتن لەگەڵ بەرامبەردا.

**half-wit** (haf′wit′, häf′wit′), *n.* کەسێکی کەڕو بێ مێشک.

**half-witted** (haf′wit′id, häf′wit′id), *adj.* کەڕو بێ مێشک.

**halibut** (hal′ə-bət), *n.* ماسییەکی گەورەی دەریاییە.

**hall** (hôl), *n.* (١) کۆشک (٢) [H-]، فەرمانگە و جێی کۆبوونەوە. (٣) خانوویەکی گشتی (بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی). (٤) هۆڵ (زانکۆ، کۆلیج)؛ ژوورێکی گەورە. (٥) (ا) کۆلیجێکی بچووکی زانکۆیەکی ئینگلیزی. (ب) خانووی ئەم کۆلیجە. (٦) ڕاڕەو.

**hallelujah, halleluiah** (hal′ə-lōō′yə), *interj. & n.* سوپاس بۆ خودا؛ هالیلویا: هاوارێکە خۆشی و پەسەند کردن دەگەیێنێت.

**hallmark** (hôl′märk′), *n.* (١) مۆرێکە لەسەر شتومەکی زێڕو زیوی ئینگلیزی هەڵدەکەنرێت کە نیشانەی ڕەسەنی و ڕاستەقینەیی دەگەیێنێ (٢) نیشانەی ڕەسەنی و باشی و ڕاستەقینەیی.

**halloo** (hə-lōō′), *v.i., v.t., interj. & n.* بانگ کردن بە دەنگی بەرز؛ هاوارکردن؛ هاوار.

**hallow** (hal′ō), *v.t.* (١) پیرۆزکردن. (٢) بە پیرۆز دانان؛ پەرستن.

**hallow** (hə-lō′), *v.i., v.t., interj. & n.* = **halloo.**

**hallowed** (hal′ōd), *adj.* پیرۆز.

**Halloween** (hal′ō-ēn′, häl′ə-wēn′), *n.* جەژنی هەموو پیاوچاکان یا پیاوە پیرۆزەکان کە ڕێکەوتی دوا ڕۆژی "ئۆکتۆبەر" دەکات و وەک "شەوی شەوی بەراتێ"ی کوردەواری وایە.

**hallucinate** (hə-lōō′sə-nāt′, hə-lū′sə-nāt′), *v.i.* تووشی "هەلوەسە" بوون، واتە مێشک تێکچوون و شتی سەیرو ناڕاست هاتنە بەرچاو و وڕێنەکردن.

*v.t.* تووشی "هەلوەسە" کردن.

**hallucination** (hə-loo′sə-nā′shən, hə-lū′sə-nā′shən), *n.* هەلوەسە: مێشک تێکچوون و شتی سەیرو ناڕاست هاتنە بەرچاو و وڕێنەکردن.

**hallucinosis** (hə-lōō′sə-nō′sis), *n.* نەخۆشی "هەلوەسە" کە تووشی مێشک دەبێت.

**hallway** (hôl′wā′), *n.* ڕاڕەو؛ داڵان.

**halo** (hā′lō), *n.* (١) خەرمانە (مانگ، ڕۆژ). (٢) تریفە: ئەڵقەیەکی ڕووناکە بە دەوری سەری پیاوچاکێکدا کە نیشانەی پاکی و پیرۆزییە. (٣) ئەو پیرۆزی و مەزنی و بەرزییە کە دەدرێتە پاڵ هەندێ کەسی ئەفسانەیی یا مێژوویی.

**halt** (hôlt), *n.* وەستان؛ ڕاوەستان.

*( to come to a ~ ; to bring to a ~ )*

*v.i. & v.t.* وەستان؛ ڕاوەستان؛ وەستاندن؛ ڕاوەستاندن؛ ڕاگیرکردن؛ بەربەستکردن.

**call a halt,** وەستاندن؛ فەرمانی ڕاوەستاندن دان.

**halt** (hôlt), *v.i.* (١) شەلین. (٢) (ا) بڕوا بەخۆ نەبوون لە دووانا؛ وەک لاڵ دووان؛ زۆر زۆر وەستان و دەم بەیەکدا هاتن لە دووانا: *( He ~s in his speech.)* (ب) دوودڵ و ڕاڕا بوون لە کاردا. (٣) ناتەواو و نابەجێ بوون (بیروباوەڕ، نووسین).

*n.* [Archaic], شەل.

**halter** (hôl′tēr), *n.* (١) ڕەشۆ؛ ڕەشوە؛ ڕەشمە. (٢) پەتی هەڵواسین یا بە سێدارەدا کردن. (٣) هەڵواسین (تاوانبار)؛ بە سێدارەدا کردن. (٤) بەرمەمکانەی ئافرەت کە بە ملەوە هەڵدەواسرێ.

*v.t.* (١) ڕەشۆکردن؛ بە ڕەشمە بەستنەوە؛ ڕەشۆ کردنەسەر. (٢) هەڵواسین (تاوانبار)؛ بە سێدارەدا کردن؛ بە پەتدا کردن.

**halves** (havz, hävz), *plural of* **half.**

**by halves,** (١) بە نیوە و نیوەچڵی؛ بە ناتەواوی. (٢) بە نابەدڵی.

**go halves hamlet,** دانی پارەی تێچوو یا خەرج کراو بە نیوانیوی.

**ham** (ham), *n.* (١) ڕان (لەش). (٢) (ا) بەشی پشتەوەی ڕان. (ب) ڕان و سمت. (٣) ڕانی گیاندارێکی چوارپێ. (٤) ڕانی بەراز؛ گۆشتی ڕانی بەراز. (٥) [Slang]، ئەکتەرێکی ئەلبی خۆنوێنەر. (٦) [Slang]، کارکەرێکی نەشارەزای ڕادیۆ یا لاسلکی: *( a radio ~ )*

**hamburger** (ham′būr′gēr), *n.* هامبرگەر: ساندویچێکی گۆشتی

کوتراوی برژاوی گا

**hamlet** (ham′lit), *n.* کوێره دێ؛ دێیەکی زۆر بچووك.

**hammer** (ham′ēr), *n.* (١) چەکوش
(٢) شتێك کە لە چەکوش بکات: (ا) پیتکەی تفەنگو دەمانچە.
(ب) زەنگ لێدەر (ج) ئەو بەشەی پیانۆ کە لە ژێکانی دەدات.
(٣) ئێسقانی گوێی ناوەوە.
(٤) (ا) چەکوشی سەرۆکی کۆڕ یا پەرلەمان. (ب) چەکوشی مەزاتکەر.
*v.t.* (١) بە چەکوش لێدان؛ پیادان بە چەکوش.
(٢) چەکوش کاری کردن؛ داکوتان بە چەکوش؛ داچەقاندن بە چەکوش.
(٣) بە زۆر خستنەناو. *( ~ the idea into his head.)*
*v.i.* بە چەکوش لێدان یا پیادان.
**hammer (away) at,** (١) هەمیشە خەریك بوونو کۆشش لەگەڵدا کردن
(٢) باس کردن یا ووتنەوە جار لەدوای جار.
**hammer out,** (١) گەلاڵەکردن؛ ڕێكوپێك کردن.
(٢) پان کردنەوە بە چەکوش. (٣) ڕاستکردنەوە بە چەکوش (قوپاوی).
**under the hammer,** خراوەتە مەزاتەوە؛ لە مەزاتدایە.

**hammer and sickle,** چەکوشو داس (ئاڵا).

**hammock** (ham′ək), *n.* جۆلانێ؛ جۆلانە

**hamper** (ham′pēr), *v.t.* ڕێ لێگرتن؛ دواخستن؛ کۆسپ خستنەبەر ڕێگا

**hamper** (ham′pēr), *n.* زەمیلەیەکی گەورەی سەرگیراو

**hamster** (ham′stēr), *n.* گیانداریکی کرۆژەندەیە لە مشکەکوێرە گەورەترە هەندێ جار لە تاقیگە بەکاردەهێنرێ بۆ تاقیکردنەوەی زانستی.

**hamstring** (ham′striŋ′), *n.* (١) دەماری پشت ئەژنۆی مرۆڤ.
(٢) دەماری پشت قولەقاچی گیانداری چوارپێ.
*v.t.* (١) لەکارخستن بە بڕینی دەماری پشت ئەژنۆ یا پشت قولەپێ؛ شەلوکۆج کردن (٢) پەککستن؛ هێز لێ بڕین؛ لەکارخستن.

**hand** (hand), *n.* (١) دەست؛ دەس
(٢) لا؛ دەس *( at your right ~ )* .
(٣) دەسەلات *( He rules with an iron ~ . )* .
(٤) چاودێری *( The child is in good ~ . )* .
(٥) بەشداری *( Take a ~ in this work.)*
(٦) دەس تێدابوون *( One can see his ~ in the affair.)* .
(٧) تەوقە (نیشانەی بەڵێن، برادەرێتی، ڕێکەوتن، پەسەندکردن):
*( Give me your ~ on that.)*
(٨) بەڵێنی خواستن یا ژنهێنان: *( He asked for her ~ . )* .
(٩) کارامەیی؛ شارەزایی؛ توانای کارکردن بە دەس:
*( This work shows a master's ~ . )*
(١٠) شێوەی کردنی کارێك.
(١١) دەستنووس؛ دەسنووس؛ دەسخەت (١٢) ئیمزا.
(١٣) چەپڵە *( They gave the singer a ~ . )* .
(١٤) یارمەتی؛ یاریدە *( Lend me a ~ . )*
(١٥) کەسێك کە ئیشی دەستی دەکات (کەشتیەوان، وەرزێر، کرێکار).
(١٦) سەرچاوە (١٧) وێنەی دەس (بۆ ڕێ نیشاندان).
(١٨) نیشاندەر (خولەك ژمێر یا کاتژمێر): *( the ~s of a clock)* .
(١٩) پانایی بەری لەپ (پێوانێکە نزیکەی چوار گرێیە).
(٢٠) (ا) سەرجەمی کاغەزی دەسی قومارچی؛ دەستی یاریکەرێك.
(ب) سەرجەمی ئەو کاغەزانەی بەش دەکرێت بەسەر یاریکەراندا.
(ج) یاریکەرێك (د) دەستێك یاری کردن. (٢١) (ا) هێشووە مۆز.
(ب) چەپکێك گەڵا توتن.
*adj.* (١) دەست؛ تایبەتی بە دەست. (٢) دەستی (کار)؛ بە دەست کراو.
*v.t.* (١) دانەدەست؛ پێدان؛ پێ گەیاندن. (٢) بردن بۆ؛ یارمەتیدان.
(٣) پێچانەوەی بایەوانی کەشتی.
**ask for a lady's hand,** داواکردن (بۆ شووپێکردن)
**(at) first hand,** لە سەرچاوەکەوە؛ یەکسەر
**at hand,** (١) نزیك. (٢) ئامادە.
**at the hand (or *hands*) of,** بە دەستی؛ لە سایەی (بەتەوسەوە)؛ بەهۆی.
**bite the hand that feeds one,** گاز لەو دەستە گرتن کە خواردنت دەداتێ، واتە هەڵگەڕانەوە لەو کەسەی چاکەت لەگەڵ دەکات؛ نمەك کوێری کردن
**by hand,** بە دەست، واتە نەك بە مەکینە.
**change hands,** دەستاودەست کردن؛ خاوەن گۆڕان.
**force one's hand,** زۆر لە کەسێك کردن کە نیازی خۆی دەربڕێ یا خۆی بخات بە لایەکدا پێش ئەوەی ئامادە بێت.
**from hand to mouth,** لە دەستەوە بۆ دەم؛ بێ دەرامەت؛ بە کولەمەرگی ژیان.
**hand and foot,** (١) دەستو پێ بەستنەوە.
(٢) هەمیشە دڵسۆزانە *( She will wait on him hand and foot.)*
**hand down,** (١) بۆ بەجێهێشتن (کەلەپوور، میرات).
(٢) بڕیاردان (دادگەر): *( The judge handed down his decision.)*
**hand in,** دانەدەست؛ پێدان؛ دان.
**hand in hand,** (١) دەست لە دەستی یەکدا.
(٢) شان بە شانی یەکتری؛ پێکەوە؛ پشت بە یەکتری.
**hand out,** بەخشینەوە؛ دابەشکردن؛ بەشکردن.
**hand over,** دەست لێ هەڵگرتن؛ دانەدەست؛ پێدان.
**hand over fist, [Colloq.],** بە ئاسانیو زۆر.
*( He is making money hands over fist.)*
**hands down,** بە ئاسانی.
*( He can beat him hands down.)*
**hands off !** دەستی لێ مەدە!؛ دەستی تێوە مەدە!؛ وازی لێ بهێنە؛ دەستکاری مەکە!.
**hands up!** دەست بخەرە سەر سەرت!؛ دەست هەڵبڕەو خۆت بدە بەدەستەوە.
**hand to hand,** لە نزیکەوە (شەڕ)؛ شەڕی دەستەویەخە.
*( hand to hand combat)*
**have one's hands full,** سەرقاڵ؛ سەرقاڵ بوون.
**hold hands,** دەستی یەکتر گرتن (خۆشەویستی).
**in hand,** (١) لەژێر دەستدایە. (٢) دەست دەکەوێت؛ هەیە؛ لە دەستایە.
(٣) خەریکە ئامادە دەکرێت.
**join hands,** (١) دەستی یەکتر گرتن؛ هەرەوەزکردن؛ بوون بە بەشدار.
(٢) بوون بە ژنومێرد؛ یەکتری مارەکردن.
**lay hands on,** (١) هێرش بردنەسەر؛ ئازاردان.
(٢) گرتن؛ گرتنەدەست؛ دەست بەسەرداگرتن.
(٣) دەست خستنەسەرو پیرۆزکردن.
**not lift a hand,** هیچ نەکردن؛ هیچ هەوڵ نەدان.
**off one's hands,** لەژێر چاودێریدا نەمان؛ هەق بەسەرەوە نەمان.
**on hand,** (١) نزیك. (٢) لەبەردەستدایە؛ هەیە. (٣) ئامادە.
**on one's hand,** لێپرسراو؛ لەژێر چاودێریدا.
**on the one hand,** لە سەرێکەوە؛ لە لایەکەوە.
**on the other hand,** (بەڵام) لە سەرێکی ترەوە؛ لە لایەکی تریشەوە.
**out of hand,** (١) لە دەست دەرچوو؛ دابین ناکرێ؛ لە دەستدا نەماوە.
(٢) یەکسەر بەبێ بیرلێکردنەوە. (٣) تەواو
**shake hands,** تەوقەکردن.
**show one's hand,** نیازی خۆ ئاشکراکردن.
**throw up one's hands,** وازهێنان؛ کۆڵ دان؛ دەست هەڵگرتن.
**wash one's hands of,** دەست لێ شتن.
**with a heavy hand,** (١) بە ناشرینی. (٢) بە توندوتیژی.
**with a high hand,** بە لووت بەرزییەوە؛ بە لەخۆباییەوە.
**with clean hands,** بە پاکی؛ بەبێ تاوان.

**handbag** (hand′bag′), *n.* (١) جانتای دەستی ژنانە.

(٢) جانتای دەست

**handball** (hand′bôl′), *n.* (١) یارییەکی دووکەسی یا چوارکەسی
ڤوورەوەیە تۆپێکی بچووکی تێدا دەدرێت بە قەد دیوارێکدا.

**handbarrow** (hand′bâr′ō), *n.* عەرەبانەی دەستی؛
عەرەبانەی خۆڵ.

**handbook** (hand′book′), *n.* (١) پەیڕەونامە؛ پەرتووکی سەرچاوە
(ڕێزمان، زانست... هتد)؛ ڕابەرنامە. (٢) ڕابەرنامەی گەشتکەران؛ ڕێنامە.
(٣) بەرنامەی گرەو (ڕێسن).

**handbreadth** (hand′bredth′), *n.* پانایی بەری لەپ
(پێوانێکە بریتییە لە چوار گرێ).

**hand-cart** (hand′kärt′), *n.* عەرەبانەی دەستی.

**hand-clasp** (hand′klasp′ hand′kläsp′), *n.* تەوقە؛
تەوقەکردن

**handcuff** (hand′kuf′), *n. (pl.).* کەلەپچە؛ دەسبەند.
*v.t.* کەلەپچەکردن؛ کەلەپچە کردنەدەست.

**handful** (hand′fool′), *n.* (١) پڕ مشت؛ مشت؛ مست؛ لالوپێچ.
(٢) ژمارەیەکی کەم؛ چەند: *( a mere ~ of people)* .
(٣) زۆر؛ فرە؛ بەس
(٤) [Colloq.]: کەسێك یا شتێکی بە زەحمەت دابینکراو.

**hand glass,** (١) گەردبین (بۆ خوێندنەوەی چاپەمەنی بچووك).
(٢) ئاوێنەی بچووکی دەسکدار. (٣) شووشەی ڕووەك داپۆشین.

**hand grenade,** نارنجۆك؛ نارنجە

**handgrip** (hand′grip′), *n.* (١) تەوقە؛ تەوقەکردن؛ بە قایم گرتن
بە دەست. (٢) دەسك (٣) *(pl.)* شەڕی دەستەویەخە

**come to handgrips,** شەڕی دەستەویەخە کردن.

**handicap** (han′di-kap′), *n.* (١) ملەملێیەکە کە کۆسپی تێدا
دەخرێتە بەردەم بەهێزەکان و یارمەتی بێ هێزەکان دەدرێت بۆ ئەوەی هەل
بردنەوە بدرێت بە هەمووکەس. (٢) (ا) کۆسپ (لەبەردەم یاریکەری بەهێزدا).
(ب) یارمەتی (بۆ یاریکەری بێ هێز). (٣) کەم ئەندامی؛ ناتەواوی؛ کەموکووڕی.
*v.t.* (١) کۆسپ خستنەبەردەم یاریکەری بەهێز؛ یارمەتیدانی یاریکەری
بێ هێز (٢) کۆسپ خستنەڕێ؛ دەست بەستنەوە؛ پەکخستن.

**handicapped** (han′di-kapt′), *adj.* پەککەوتە؛ کەم ئەندام.

**handicraft** (han′di-kraft′, han′di-kräft′), *n.* (١) شارەزایی
لە ئیشی دەستدا؛ کارامەیی پیشەی دەستی. (٢) پیشەی دەستی (جۆلایی،
تەنین، بەرە کردن، گۆزەودیزەکاری).

**-handicraftsman** *(n.).*

**handily** (han′d'l-i), *adv.* (١) بە باشی و ڕێك وپێکی؛ کارامانە.
(٢) بە ئاسانی

**handiwork** (han′di-wûrk′), *n.* (١) ئیشی دەست؛ کاری دەست.
(٢) شتی دەستکرد
(٣) ئەنجامی کرداری خۆ؛ دەستکردی خۆ: *( This mess is my ~ .)* .

**handkerchief** (haŋ′kẽr-chif, haŋ′kẽr-chēf′), *n.* دەستەسڕ

**hand-knit** (hand′nit′), *adj.* بە دەست چنراو

**hand-knitted** (hand′nit′id), *adj.* = **hand-knit.**

**handle** (han′d'l), *n.* (١) دەسك؛ کلك (ئامێر)؛ قوڵفە؛ قوڵف؛ مشتو.
(٢) شتێکی وەك دەسك. (٣) هەل؛ شتێك کە بەکاردەهێنرێت بۆ مەبەستی خۆ.
(٤) سەرناو؛ نازناو
*v.t.* (١) دەست تێوەدان؛ بە دەست بەرزکردنەوە.
(٢) دەستکاری کردن؛ بە دەست کردن.
(٣) کردن؛ بەڕێوەبردن؛ سەرەوکاری کردن؛ دابینکردن.
(٤) جێبەجێکردن؛ کردن؛ ڕاپی کردن؛ خەریك بوون:
*( Our office ~s many requests.)*
(٥) نووسین یا دووان دەربارە. (٦) پیشەوکاروبار ئەوە بوون.
(٧) لەگەڵ جووڵانەوە؛ ڕەفتارکردن یا نواندن لەگەڵ.
*v.i.* کارکردن؛ ئیشکردن؛ بەڕێوەبران: *( The car ~s well.)* .

**fly off the handle,** [Colloq.], لەپڕ هەڵچوون یا تووڕەبوون

**handle bar,** دەسکی پاسکیل و ماتۆڕسایکل.

**handler** (han′dlẽr), *n.* (١) مەشق دادەر؛ ڕاهێنەر؛ فێرکەر:
*( a dog ~ )*
(٢) مەشق دادەر یا بەڕێوەبەری کاروباری بۆکسبازی.

**hand-made** (hand′mād′), *adj.* دەستکرد؛ بە دەست کراو نەك بە
مەکینە.

**handmaid** (hand′mād′), *n.* کارەکەر؛ بەردەستی ژن.

**handmaiden** (hand′mād′n), *n.* = **handmaid.**

**hand out,** بەخشینەوە (پارە، جل وبەرگ، خواردەمەنی)؛ بڵاوکردنەوە
(نامیلکە، بڵاونامە، نووسراو).

**handout** (hand′out′), *n.* (١) خێر؛ پارەو جل وبەرگ و خواردەمەنی
دراو بە کەسێکی بێ دەرامەت. (٢) نامیلکە؛ بڵاونامە، یا نووسراوی دابەشکراو.
(٣) دەنگ وباسی بڵاوکراوە.

**hand-picked** (hand′pikt′), *adj.* (١) بە دەست هەڵبژێرراو (میوە،
سەوزە). (٢) دەستنیشانکراو؛ ناونیشان کراو یا هەڵبژێرراو:
*( a ~ candicate, successor, etc.)*

**handrail** (hand′rāl′), *n.* تەیمانی شیشە ئاسن (بە قەراغی پێ
پلیکانەدا بۆ دەست پێوەگرتن).

**handsaw** (hand′sô′), *n.* مشاری دەست؛ مشار.

**handsel** (hand′s'l, han′s'l), *n.* (١) دیاری سەری ساڵی تازە.
(٢) [Rare]، (ا) یەکەم قیست. (ب) سفتاح. (٣) نۆبەرە.
*v.t.* (١) دیاری پێدان. (٢) ڕەنگ ڕشتن؛ کردنەوە بە ئاهەنگ (شوێنێکی تازە).
(٣) نۆبەرەلێکردن؛ کردن یا بەکارهێنان بۆ یەکەم جار.

**handshake** (hand′shāk′), *n.* تەوقە؛ تەوقەکردن.

**handsome** (han′səm), *adj.* (١) زۆر (مووچە، پارە):
*( a ~ salary, sum, etc.)*
(٢) بەجێ؛ پەسەند؛ باش؛ شیاو: *( It was ~ of him to say that.)* .
(٣) (ا) قۆز (پیاو)؛ شۆخ و ئێسك سووك (پیاو): *( a ~ man)* .
(ب) جوان و باش: *( a ~ book, piece of work, etc.)* .

**hand-to-hand** (hand′tə-hand′), *adj.* دەستەویەخە (شەڕ)؛
زۆر لە نزیکەوە: *( ~ combat)*

**hand-to-mouth** (hand′tə-mouth′), *adj.* ژیانی کولەمەرگی؛
بێ دەرامەتی؛ بێ قایمەکاری بۆ دواڕۆژ.

**handwork** (hand′wûrk′), *n.* ئیشی دەستکرد؛ بە دەست کراو نەك
بە مەکینە.

**handwriting** (hand′rīt′iŋ), *n.* (١) نووسین بە دەست.
(٢) دەسخەت؛ نووسین.
(٣) [Archaic]، دەستنووسێك؛ شتێکی بە دەست نووسراو (پەرتووك،
نامیلکە).

**see the handwriting on the wall,** نیشانەی بەدبەختی و ناخۆشی
و کارەساتی داهاتوو بە ڕوونی بینین.

**handy** (han′di), *adj.* (١) نزیك؛ لەبەردەستدایە؛ بە ئاسانی دەست
دەکەوێ؛ ئاسان. (٢) باش (ئامێر)؛ بە ئاسانی بەکاردەهێنرێت (ئامێر)؛
بە کەڵك: *( a ~ device)* .
(٣) بەئاسانی لێ دەخوڕرێت (کەشتی).
(٤) کارامە (لە کاری دەستدا)؛ سەردەرچوو؛ بزان (کاری دەست).

**handyman** (han′di-mən), *n.* هەمەکار؛ کەسێك یا کرێکارێکی
شارەزا لە هەموو وردەکارێکی دەستیدا، وەك چاککردنەوەو دانان و
درووستکردنی شتی ناومال و فەرمانگەو کارگە.

**hang** (haŋ), *v.t.* (١) هەڵواسین (جل، شتومەك).
(٢) کردن بە پەتەوە؛ لە سێدارەدان؛ خنکاندن؛ هەڵواسین؛ لە قەنارەدان.
(٣) وێنە هەڵواسین. (٤) ڕازاندنەوە بە شتی هەڵواسراو.
(٥) پیشاندانی وێنەو تابلۆ لە مۆزەخانەدا.
(٦) ڕێگرتن لە بڕیاردانی گشتی کۆڕێك بە دژوەستان و دەنگدان بەو جۆرە

(ئەنجوومەنی سوێندخوارانی دادگا).

*v.i.* (١) هەڵواسران؛ هەڵواسین. (٢) شۆڕبوونەوە (جل‌وبەرگ).
(٣) بە سێدارەدا کران؛ بە پەتەوە کران؛ لە قەنارەدران. (٤) بەلاداکەوتن.
(٥) ڕاڕایی کردن؛ دوودڵی کردن.
(٦) پیشاندانی وێنەو تابلۆی خۆ لە مۆزەخانەدا.

*n.* (١) شێوەی شۆڕبوونەوەو وەستانی شتێک.
(٢) شێوەی کردنی کارێک یا شتێک: *( to get the ~ of it)* .
(٣) مانا یا گرنگی شتێک. (٤) وەستان؛ ڕاڕایی.
(٥) لێژایی؛ سەرەوخوارکە.

**hang around ( or about ),** (١) لە دەور کۆبوونەوە؛ لە دەوروپشت بوون (٢) [Colloq.]، کات کوشتن‌و خۆ خستن بە قنگدا؛ هەمیشە لە ئارادا بوون‌و هیچ نەکردن‌و تەمەڵی کردن.

**hang back,** (١) دواکەوتن (٢) دوودڵی کردن‌و خۆ لە دواوە گرتن یا هیچ نەکردن (لە ترسدا یا لە شەرمدا).

**hang on,** (١) دەست پێوەگرتن؛ دەست لێ بەرنەدان.
(٢) کۆڵ نەدان؛ بەردەوام بوون؛ وازنەهێنان.
(٣) لەسەر بەنگ بوون؛ کەوتنەسەر.
(٤) قورسایی لەسەر شتێک بوون؛ پاڵپشتی کران؛ لەسەر بەندبوون.
(٥) باش گوێ لێگرتن.

**hang out,** (١) شۆڕبوونەوە؛ سەردەرهێنان.
(٢) [Slang]، (أ) نیشتەجێ بوون؛ ژیان لە شوێنێک.
(ب) زوو زوو چوونە شوێنێک؛ زۆر کات بردنەسەر لە شوێنێک:
*( He hangs out in that cafe.)*

**hang over,** (١) بە سەردا شۆڕبوونەوە؛ بە سەرەوە بوون.
(٢) خول خواردن بەسەردا یا بە دەوردا؛ بە سەردا گەڕان یا سووڕانەوە؛ چاودێری کردن. (٣) هەڕەشەلێکردن؛ دەوردان‌و ترس خستنەبەر.
(٤) لە کۆنەوە بۆ مانەوە.

**hang together,** (١) بەیەکەوە نووسان.
(٢) یەکگرتن؛ پشتی یەکتری گرتن.

**hang up,** (١) هەڵواسین (جل‌وبەرگ، وێنە). (٢) تەلەفۆن داخستن.
(٣) تەلەفۆن لەسەر داخستن: *( to hang up on somebody)* .
(٤) وەستاندن (گفتوگۆ، کار)؛ ڕاگیرکردن؛ دواخستن.

**hanger** (haŋ′ēr, haŋ′gär), *n.* گەراجی فڕۆکە؛ مۆلگەی سەر داپۆشراوی فڕۆکە

**hanger** (haŋ′ēr), *n.* (١) شت هەڵواسین (مرۆڤ).
(٢) پیاوکوژ؛ پیاو بەپەتەوەکەر؛ مرۆڤ لە قەنارەدەر.
(٣) شتێکی شۆڕبووەوە (شیر بە پشتێنەوە). (٤) شتی شتومەك پیا هەڵواسین (قولاپ، بزمار، پەت، عەللاگەی جل‌وبەرگ).

**hanger-on** (haŋ′ēr-on′), *n.* (١) خۆپیاهەڵواسینەر؛ پاشکۆ.
(٢) مفتخۆر؛ لاکوت؛ مشەخۆر.

**hanging** (haŋ′iŋ), *adj.* (١) هەڵواسراو (٢) شۆڕبووەوە؛ داهێڵراو.
(٣) خوار؛ لار (٤) نەبڕاوە؛ بەلایەکدا نەکەوتوو.
(٥) خەمبار؛ دڵگیر؛ پەست.
(٦) شایستەی هەڵواسینە؛ بافتی کردن بە پەتەوەیە.

*n.* (١) هەڵواسین (شتومەك). (٢) هەڵواسین (مرۆڤ)، بە پەتەوە کردن؛ لە قەنارەدان. (٣) *(pl.)* شتومەکی بە دیوارەوە یا پەنجەرەوە هەڵواسراو.

**hangman** (haŋ′mən), *n.* پیاوکوژ؛ مرۆڤ بە سێدارەداکەر.

**hang-nail** (haŋ′nāl′), *n.* زیادە نینۆك؛ پارچە پێستێکی مردوو لە قەراغ یا بنی نینۆکەوە

**hang-out** (haŋ′out′), *n.* [Slang], هەوارگە؛ لانە؛ شوێنێکە کە کەسێك زوو زوو سەری لێ بدات.

**hang-over** (haŋ′ō′vēr), *n.* (١) پاشماوەی کۆن؛ شتێکی لە کۆنەوە ماوە. (٢) سەرئێشەو دڵ تێکەڵهاتنی ڕۆژی دوای سەرخۆشی؛ سەرخۆشی بەرنەدانی ڕۆژی دوای خواردنەوە.

**hank** (haŋk), *n.* (١) کلافە (دەزوو، بەن). (٢) ئەڵقەیەکی ئاسن یا دارە بایەوانی کەشتی‌و بەلەمی پیا هەڵدەواسرێت.

**hanker** (haŋ′kēr), *v.i.* ( ~ **for**; ~ **after**), حەزلێکردن؛ دڵ بۆ لێدان؛ بە تاسەوە بوون بۆ؛ بێزو بۆ کردن.

**hanky-panky** (haŋ′ki-paŋ′ki), *n.* [Colloq.], (١) فێڵبازی؛ ساختە؛ ساختەچێتی؛ گزی کردن؛ دووڕوویی؛ ناپاکی (بەتایبەتی لە دڵداری‌و ژن‌ومێردایەتیدا). (٢) ووتەو کردەوەی هیچ‌وپووچ‌و بێ مێشکانە.

**hansel** (han′s'l), *n.* = **handsel.**

**hansom** (han′səm), *n.* عەرەبانەیەکی سواری دووپێچکەیی یەك ئەسپییە.

**hap** (hap), *n.* (١) بەخت؛ شانس؛ هات‌ونەهات.
(٢) *(pl.)* ڕوودان.

*v.i.* [Archaic], بە ڕێکەوت ڕوودان.

**haphazard** (hap′haz′ẽ-rd), *n.* ڕێکەوت؛ لامسەرلا.
*adj.* بەڕێکەوت؛ بەلامسەرلا.
*adv.* بەڕێکەوت؛ بەلامسەرلایی.
-**haphazardly** *(adv.)*; **haphazardness** *(n.)*.

**hapless** (hap′lis), *adj.* بەدبەخت؛ کوڵۆل.

**haply** (hap′li), *adv.* [Archaic], بەڕێکەوت؛ بەڵکو؛ بەشکو؛ لەوانەیە.

**happen** (hap′'n), *v.i.* (١) ڕوودان؛ قەومان؛ هاتنەڕوو.
(٢) بەڕێکەوت ڕوودان.
(٣) وا ڕێکەوتن؛ وا هەڵکەوتن: *( I ~ed to see it.)* .
(٤) [Colloq.]، لەخۆوە دەرکەوتن.

happen on (or *upon* ), تووش بوون یا دۆزینەوە بەڕێکەوت

happen to, لێ ڕوودان؛ بەسەرداهاتن.

**happening** (hap′'n-iŋ), *n.* ڕوودان؛ ڕووداو؛ بەسەرهات.

**happily** (hap′'l-i), *adv.* (١) بەوەی باش بوو؛ بۆ بەخت باشی.
(٢) بە بەختیاری؛ بە خۆشی؛ بە دڵشادی.
(٣) بە ڕێك‌وپێکی؛ بە باشی؛ بە زمانپاراوی.

**happiness** (hap′i-nis), *n.* (١) بەختیاری؛ شادی؛ کامەرانی؛ خۆشی‌و شادی؛ ئاسوودەیی؛ دڵخۆشی. (٢) بەختەوەری؛ خۆش بەختی؛ بەخت.
(٣) شیاوی؛ پەسەندی.

**happy** (hap′i), *adj.* (١) بەختەوەر؛ خۆش بەخت
(٢) بەختیار؛ دڵشاد؛ شاد؛ کامەران؛ دڵخۆش.
(٣) پەسەند؛ بەجێ؛ شیاو: *( a ~ suggestion)* .
(٤) خۆش: *( ~ news)* .

**happy-go-lucky** (hap′i-gō-luk′i), *adj. & adv.* بێباك؛ بێ خەم؛ بێ مەراق؛ گوێ نەدەر.

**harangue** (hə-raŋ′), *n.* ووتارێکی دوورودرێژو لەخۆباییانەو بە هاوارو دڕندانەو هێرشاوی.

*v.i. & v.t.* ووتارێکی وەها دان یا خوێندنەوە.

**harass** (har′əs, hə-ras′), *v.t.* هەراسان کردن؛ هەراس پێ هەڵگرتن.

**harassment** (har′əs-mənt, hə-ras′mənt), *n.* (١) هەراسان کردن؛ هەراسان بوون. (٢) هەراسان؛ شتێکی هەراسانکەر.

**harbinger** (här′bin-jēr), *n.* (١) پێشەنگ. (٢) مژدەهێنەر؛ نۆبەرە؛ شتێك کە نیشانەی ڕوودانی دواڕۆژ بێت لە باشی‌و خراپیدا.

*v.t.* پێش بینین؛ نیشانەی ڕوودانێکی دواڕۆژ بوون.

**harbor** (här′bēr), *n.* (١) پەناگا؛ پەنا؛ لانە. (٢) بەندەر.

*v.t.* (١) پەنادان؛ گرتنەخۆ؛ جێکردنەوە؛ لانەدان‌و شاردنەوە؛ داڵدەدان: *( to ~ a fugitive)* .
(٢) گرتنەدڵ؛ لە دڵدا هەڵگرتن؛ لە بیرنەچوونەوە:
*( to ~ a grudge, animosity, etc.)*

*v.i.* پەنابردنەبەر بەندەر.

**harborage** (här′bēr-ij), *n.* (١) بەندەر؛ پەناگای کەشتی‌و بەلەم.
(٢) پەناگا؛ پەنا؛ لانە؛ داڵدەدان؛ لانەدان.

**harbor master,** بەڕێوەبەری بەندەر.

**hard** (härd), *adj.* (١) ڕەق؛ سەخت؛ پتەو (٢) وورده (پاره)
(٣) تەندروست؛ بەهێزوبازوودار
(٤) توند؛ قایم *( a ~ blow)* .
(٥) قورس (کار)؛ سەخت؛ گران: *( ~ work)*
(٦) قورس (پرسیار)؛ گران: *( a ~ question)* .
(٧) هاردەم سەخت *( a man ~ to live with)* .
(٨) دڵڕەق؛ بێ بەزەیی *( a ~ heart)* .
(٩) ناخەلەتێ؛ زۆرزان *( a ~ customer)*
(١٠) دژوار؛ ناخۆش؛ سەخت: *( a ~ life)* .
(١١) توندوتیژ (مرۆڤ، لەگەڵ جووڵانەوه)؛ زۆردار
*( a ~ master; ~ words)*
(١٢) سەخت (ئاووهەوا): *( a ~ winter)*
(١٣) گرێ کوێره *( a ~ knot)* .
(١٤) زەق (ڕەنگ)؛ تیر (ڕەنگ): *( a ~ red)*
(١٥) ناساز (ئاو)
(١٦) بەکار؛ زۆر کۆششکەر؛ بە دڵ کارکەر؛ کۆڵنەدەر: *( a ~ worker)* .
(١٧) کحول زۆر تێدایە *( ~ liqnor)* .
(١٨) پتەو (نرخ، بازاڕ)؛ گەرم (بازاڕ)
(١٩) گرانبەها (پاره): *( ~ currency)* .
(٢٠) بە گوێ گرانەو خۆش نییە (وەك تیپی " c " و " g " کە بە "ك" و "گ" دەخوێنرێنەوه): *( a ~ "c" ; a ~ "g" )*
*adv.* (١) بەدڵ؛ بەبێ کۆڵ دان: *( Work ~ . )* .
(٢) بە توند؛ بە قایم؛ بە هێزەوه *( Hit ~ . )* .
(٣) بە زەحمەت؛ بە ئارەقی ئاوچەوان: *( ~ -earned money)* .
(٤) بە ئاسانی وازنەهێنەر.
(٥) توند؛ بەتوند؛ قایم: *( Hold on ~ . )* .
(٦) نزیك

**be hard on,** (١) بە توندوتیژی لەگەڵدا جووڵانەوه.
(٢) ناخۆش بوون بۆ؛ ئێش و ئازار پێدان (ڕوودان)

**hard and fast,** توندوتیژ؛ نەگۆڕ (پەیڕەو)؛ لێی لا نادرێت:
*( hard and fast rules)*

**hard of hearing,** گوێ گران

**hard up,** [Colloq.], داماو (بەتایبەتی بۆ پاره)؛ زۆر پێویستی شتێك بوون یا بۆی بەتاسەوەبوون؛ پەرێشان بوون بۆ.

**hard-boiled** (härd′boild′), *adj.* (١) باش کوڵاو یا ڕەق (هێلکە)
(٢) دڵڕەق؛ بێ هەست؛ بێ بەزەیی

**hard-bound** (härd′bound′), *adj.* بەرگ ڕەق (پەڕتووك).

**hard cash,** (١) پارەی وورده
(٢) پارەی ڕەق؛ پارەی ئامادە یا لە دەستدا بوو.

**hard-core** (härd′kôr′), *adj.* قاڵ؛ نەگۆڕاو؛ نەگۆڕ؛ سەخت:
*( ~ criminals)*

**hard core,** ناوکرۆکی سەختی هەرگیز نەگۆڕی کۆمەڵەیەك.
*( the ~ of the movement, party, etc.)*

**hard-cover** (härd′kuv′ĕr), *adj.* = **hard-bound.**

**harden** (här′d'n), *v.t.* (١) ڕەق کردن؛ پتەوکردن؛ سەخت کردن.
(٢) قاڵ کردن؛ بکێش کردن.
(٣) هەست کوشتن؛ بێ هەست کردن؛ دڵڕەق کردن: *( It ~ed his heart.)* .
(٤) مەیین؛ چەسپاندن؛ پتەوکردن.
*v.i.* (١) ڕەق بوون؛ بەستن؛ سەخت بوون.
(٢) (ا) بەرزبوونەوه (نرخ). (ب) چەسپین (نرخ)؛ نەگۆڕان.
(٣) دڵڕەق بوون؛ هەست مردن؛ دڵ سەخت بوون: *( His heart ~ed.)*

**-hardener** *(n.)*.

**hard-fisted** (härd′fis′tid), *adj.* ڕەزیل؛ پیسکە؛ پارەپیس؛ دەس قوچاو

**hard-handed** (härd′han′did), *adj.* (١) دەست زبر (لەبەر کاری دەستی) (٢) زۆردار؛ توندوتیژ؛ بێ ئامان؛ دڵڕەق.

**hard-headed** (härd′hed′id), *adj.* (١) کردارپەرست؛ ڕاستی بین؛ شوێن هەست نەکەوتوو. (٢) سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ سەرکێش.

**hard-hearted** (härd′här′tid), *adj.* دڵڕەق؛ بێ بەزەیی؛ بێ هەست

**hardiness** (här′di-nis), *n.* (١) کێش؛ بە کێش؛ هێز؛ دەربردن.
(٢) ئازایەتی؛ چاونەترساوی.

**hard labor,** ئیشی گران (کە سزایەکە دەدرێت بەسەر بەنددا).

**hardly** (härd′li), *adv.* (١) بە گران؛ بە زەحمەت. (٢) بە توندوتیژی.
(٣) بە دەگمەن. (٤) بە ئاستەم؛ بە حاڵ؛ هیچ. (٥) لەوانە نییە؛ بۆی نییە

**hardness** (härd′nis), *n.* (١) ڕەقی؛ ڕەقێتی. (٢) دڵڕەقی.
(٣) قورسی؛ گرانی.

**hard-nosed** (härd′nōzd′), *adj.* [Colloq.], کەللەڕەق؛ سەرکێش؛ جیڕ؛ سەرسەخت؛ سڵ نەکەرەوه.

**hard palate,** ئاسمانەی دەم.

**hardship** (härd′ship), *n.* (١) باری ناخۆشی ژیان؛ ناخۆشی؛ دژواری؛ دووچاری؛ گرفتاری؛ نەبوونی؛ تەنگانە؛ ناڕەحەتی؛ چەوسانەوه. (٢) هۆیەکی تایبەتی ناخۆشی و ناڕەحەتی و چەوسانەوه (نەبوونی، ئێش و ئازار).

**hardtop** (härd′top′), *n.* ئۆتومبیلێکە کە سەرەکەی ڕەقەو ناکرێتەوه.

**hardware** (härd′wâr′), *n.* (١) وورده شتی ئاسنین یا پۆڵایین (بزمار، پارچەی مەکینە، دەفر... هتد). (٢) کەرەسەی قورسی سوپا (چەك، لۆری هتد).

**hardy** (här′di), *adj.* (١) ئازا؛ چاونەترساو. (٢) سەرچڵ؛ سەرکێش؛ هەڵەشە. (٢) بە کێش (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).

**hare** (hâr), *n.* کەروێشکە کێوی؛ کەروێشك.

**harem** (hâr′əm), *n.* (١) بەشی ژنان لە خانوو یا ماڵی موسوڵمانێکدا.
(٢) ژن و دۆست و کارەکەر کە لەم بەشەدا دادەنیشن و ئیش دەکەن.

**hark** (härk), *v.i.* گوێگرتن؛ گوێ گره!.

**hark back,** گەڕانەوه بۆ باسێکی پێشووتر لە دووان یا بیرکردنەوەدا.

**harken** (här′k'n), *v.i. & v.t.* = **hearken.**

**Harlequin** (här′lə-kwin, här′lə-kin), *n.* کەسێکی قۆشمە؛ ئەکتەری قۆشمە.
*adj.* (١) قۆشمە. (٢) ڕەنگاوڕەنگ.

**harlot** (här′lət), *n.* قەحبە؛ ئافرەتێکی سووك

**-harlotry** *(n.)*.

**harm** (härm), *n.* زیان؛ وەی.
*v.t.* زیان لێدان؛ زیان پێگەیاندن؛ ئازاردان.

**in harm's way,** لە مەترسیدا بوون.

**harmful** (härm′fəl), *adj.* زیانبەخش؛ خراپ؛ بەد؛ بەوەی.

**harmless** (härm′lis), *adj.* بێ زیان؛ بێ وەی؛ بەسزمان.

**harmonic** (här-mon′ik), *adj.* (١) هاوسۆز؛ هاوبیروڕا.
(٢) هاوئاواز؛ یەك دان؛ ساز (مۆسیقا)؛ گونجاو.
*n.* ئاوازێکی ساز یا گونجاو.

**-harmonically** *(adv.)*.

**harmonica** (här-mon′i-kə), *n.* هارمۆنیکا: ئامێرێکی مۆسیقایە.

**harmonics** (här-mon′iks), *n.pl.* زانستی دەنگی مۆسیقایی.

**harmonious** (här-mō′ni-əs), *adj.* (١) یەك دان؛ ڕێك وپێك؛ پێکهاتوو؛ چوون یەك؛ پێکەوه گونجاو.
(٢) هاوهەست و بیروباوەڕ؛ لەگەڵ یەك گونجان.
(٣) هاوئاواز؛ یەك ئاواز؛ ساز.

**-harmoniously** *(adv.)*; **harmoniousness** *(n.)*.

**harmonist** (här′mə-nist), *n.* (١) مۆسیقای یەك ئاواز دانەر.
(٢) بوێژ؛ هۆنەر؛ شاعیر. (٣) ڕێکخەرو کۆکەرەوەی پارچە نووسراوی لەیەکچوو (بەتایبەتی لە ئینجیل دا). (٤) هاوئاوازکەر؛ یەك ئاوازکەر؛ ڕێکخەر؛ سازکەر.

**harmonize** (här′mə-nīz′), *v.i.* پێکەوه گونجان؛ ڕێکەوتن؛ هاوئاواز بوون؛ یەککەوتن.

*v.t.* گونجاندن؛ رێکخستن؛ یەك ئاواز کردن؛ یەکخستن
-**harmonization** *(n.).*
**harmony** (här′mə-ni), *n.* (١) هاوئاوازی؛ یەککەوتن؛ سازان؛ پێکەوە گونجان؛ هارمۆنی. (٢) هاوهەست و بیروباوەڕی؛ لەگەڵ یەك هەڵکردن یا گونجان؛ تەبایی. (٣) یەك دانی؛ چوونیەکی؛ ڕێکەوتن لەگەڵ یەك (ڕەنگ، شێوە، قەوارە)؛ گونجان. (٤) چەند نووسراوێکی لەیەکچووی پێکەوە ڕێکخراو (بەتایبەتی هی ئینجیل)
**harness** (här′nis), *n.* (١) قەڵغانی مرۆڤ یا ئەسپ.
(٢) زین و لغاو و سینە بەند و قایش و قرووشی ئەسپ.
(٣) کێرەوکوڵنگ؛ پەت یا قایش پێوەبەستەردوە.
*v.t.* (١) هێنانەبەر بار؛ گرتن (وڵاخ)؛ زین و لغاوکردن
(٢) بەرهەم لێ هێنانەبەر؛ ماڵی کردن؛ دابینکردن و سوود لێ وەرگرتن؛
*( to ~ the forces of Nature)*
(٣) [Archaic]. قەڵغان لەبەرکردن
**in harness,** لەبەر بار؛ لەکاتی کردنی کاری ئاسایی خۆدا؛ خەریکی کاری هەموو ڕۆژەی خۆ بوون *( to die in harness)*
**harp** (härp), *n.* (١) ئامێرێکی موسیقی ژێدارە.
(٢) شتێك کە لەم ئامێرە بکات
(٣) [Slang]. ئیرلەندیەك (لەڕووی سووکیەوە).
*v.i.* (١) لێدانی ئەم ئامێرە مۆسیقیە
(٢) ( ~ on; ~ upon ). زۆر لەسەر یەك باس ڕۆیشتن (دووان؛ نووسین)؛ نەبڕینەوە؛ درێژەپێدان؛
*( He is continually ~ing on his misfortunes.)*
**harpist** (här′pist), *n.* لێدەری ئامێری " harp "
**harpoon** (här-pōōn′), *n.* ڕمی ڕاوە نەهەنگ.
*v.t.* ڕاوە نەهەنگ کردن بەم ڕمە
**harpsichord** (härp′si-kôrd′), *n.* ئامێرێکی موسیقی ژێدارە لە پیانۆ دەکات
**harrier** (har′i-ēr), *n.* (١) جۆرە سەگێکی ڕاوی ئینگلیزیە (بەتایبەتی بۆ ڕاوی کەروێشکە کێوی).
(٢) [pl.]. دەستەیەك سەگی وەها و ڕاوچیەکان لە ڕاودا.
(٣) ڕاکەرێکی دوور
**harrier** (har′i-ēr), *n.* (١) تالانکەر؛ ڕووتکەرەکەوە
(٢) جۆرە هەڵۆیەکە
**harrow** (har′ō), *n.* ماڵەی ئاسین (بۆ زەوی تەخت کردن)
*v.t.* (١) ماڵەدان (کشتوکاڵ). (٢) بریندارکردن؛ برین
(٣) پەستکردن؛ چەوساندنەوە؛ دڵگرتن؛ نارەحەت کردن؛ دیق پێکردن.
**harry** (har′i), *v.t.* (١) تالان کردن؛ ڕووتکردنەوە
(٢) هەراسان کردن؛ دیق پێکردن؛ پەستکردن؛ چەوساندنەوە.
**harsh** (härsh), *adj.* (١) ناساز (دەنگ). (٢) زەق (ڕەنگ)
(٣) تیژ (تام)؛ تاڵ. (٤) زبر.
(٥) ناخۆش؛ ناپەسەند؛ ناساز.
(٦) بەدڕوخسار؛ ناشرین؛ قەڵب (ڕووالەت)
(٧) توندوتیژ (کردەوە)؛ ڕەق؛ بێ بەزەیی؛ *( ~ words; a ~ judge, judgement, reply, treatment, punishment, etc.)*
-**harshly** *(adv.)*; **harshness** *(n.).*
**hart** (härt), *n.* نێرە ئاسکێکی پێنج ساڵانە و گەورەتر.
**harvest** (här′vist), *n.* (١) خەرمانان؛ کاتی خەرمانان
(٢) بەرهەمی دانەوێڵە یا میوە و سەوزەی وەرزێك؛ بەروبوومی کشتوکاڵی ساڵێك (٣) دوورینەوە؛ دەغڵ و دان کۆکردنەوە؛ دروێنە و خەرمان هەڵگرتن؛ ڕنین (میوە، سەوزە)
(٤) بەرهەم؛ بەروبووم؛ ئەنجام *( Death is the ~ of war.)*.
*v.t. & v.i.* دوورینەوە؛ دروێنەکردن و خەرمان هەڵگرتن؛ دەغڵ و دان کۆکردنەوە؛ ڕنین؛ بەرهەم کۆکردنەوە
-**harvester** *(n.).*

**harvestman** (här′vist-mən), *n.* (١) درەوکەر؛ خەرمان هەڵگر
(٢) جۆرە مێروویەکی وەك جاڵجاڵۆکەیە.
**harvest moon,** مانگی چواردە شەوەی خەرمانان
**has** (haz). *the third person singular, present indicative, of-* **have.**
**has-been** (haz′bin′), *n.* [Colloq.], باونەماو (مرۆڤ، شت)؛ برەونەماو؛ لە کۆندا بەبرەو.
**hash** (hash), *v.t.* (١) جنین (گۆشت، سەوزە)؛ قاش کردن؛ لەت لەت کردن.
(٢) [Colloq.]. تێکدان؛ بەسەریەکدادان.
*n.* (١) گۆشت و سەوزەی جنراو و تێکەڵاو کراو؛ شلە. (٢) شتومەکی تێکەڵاو
(٣) چێشتی مجەور
**hasheesh** (hash′ēsh), *n.* = **hashish.**
**hashish** (hash′ēsh, hash′ish), *n.* حەشیشە؛ تلیاك؛ بەنگ.
**hasn't** (haz′'nt), = **has not.**
**hasp** (hasp), *n.* (١) ئەنجامە (دەرگا، پەنجەرە، سەرقاپ، پەڕتووك).
(٢) کلافە دەزوو
*v.t.* بە ئەنجامە لێکدان یا پێکەوەبەستن.
**hassle, hassel** (has′'l), *n.* [Slang], (١) دەمەقاڵێ؛ شەڕ؛ مشتومڕ
(٢) سەرئێشە؛ شەڕەشەق؛ گێرەوکێشە؛ گۆبەنگ.
*v.t.* هەراس پێ هەڵگرتن؛ هەراسان کردن؛ سەرخستنەسەر؛ تووشی سەرئێشە و شەڕەشەق کردن؛ پەستکردن *( Don't ~ me.)*.
**hassock** (has′ək), *n.* (١) تۆپەڵێك گیای چڕ.
(٢) کوشن؛ بالیف؛ ئەسکەملی قاچ؛ کوشنێکی ئەستوورە بۆ کڕنووش لەسەر بردن و نوێژکردن لە کڵێسەدا.
**haste** (hāst), *n.* (١) پەلە؛ خێرایی؛ دەستوبرد.
(٢) شپرزەیی؛ شپرزە؛ *( H~ makes waste.)*.
(٣) پێویستی پەلەکردن؛ پەلەیی.
**in haste,** (١) بە پەلە. (٢) بە شپرزە؛ بە شپرزەیی.
**make haste,** پەلەکردن؛ دەستوبردکردن
**hasten** (hās′'n), *v.t.* پەلەلێکردن؛ پەلەکردن؛ ڕاپەڕاندن؛ زووکردن.
*v.i.* پەلەکردن؛ زووکردن.
**hastily** (hās′t'l-i), *adv.* بەپەلە؛ خێرا؛ زوو؛ بە شپرزەیی؛ بەبێ بیرلێکردنەوە.
**hasty** (hās′ti), *adj.* (١) پەلە؛ بەپەلە؛ خێرا
(٢) بە شپرزەیی و بەبێ بیرکردنەوە کراو.
(٣) تەنگەجیکڵانە؛ زوو هەڵچوو (٤) بێ ئارام.
**hat** (hat), *n.* (١) شەپقە؛ کڵاوی فەرەنگی؛ تەپلە؛ کڵاو.
(٢) (ا) کڵاوی سەرەك قەشەی کاسۆلیك. (ب) پلەی سەرەك قەشە.
*v.t.* شەپقە کردنەسەر؛ کڵاو لەسەرکردن.
**pass the hat,** پیتاك کردن.
**take one's hat off to,** ئافەرین کردن؛ پیرۆزبایی لێکردن؛ ڕێز بۆ بوون (لەبەر کردنی کارێکی گرنگ).
**talk through one's hat,** [Colloq.], باسی شتێك کردن کە ئەو کەسە هیچی لێ نەزانێ؛ قسەی هیچ و پووچ و بێ مانا کردن
**throw on's hat into the ring,** (١) بەشداری ملەملێیەك بوون.
(٢) خۆ پاڵاوتن بۆ هەڵبژاردن.
**under one's hat,** [Colloq.], نهێنی؛ پەنهانی.
**hatch** (hach), *v.t.* (١) هەڵهێنان (هێلکە، جووجك).
(٢) هەڵهێنان (پیلان)؛ پیلان گێڕان.
*v.i.* هەڵهاتن (هێلکە، جووجك)
*n.* (١) هەڵهێنان. (٢) سەرجەمی جووجەڵەی مریشکێك یا باڵندەیەکی تر؛ دەستە جووجکی پێکەوە هەڵهاتوو. (٣) ئەنجام؛ بەرهەم
**hatch** (hach), *n.* (١) نیوەی خوارەوەی دەرگا یا چەپەرەیەك کە لە دوو بەش پێکهاتووە کە بە جیا جیا دەکرێنەوە و دادەخرێن
(٢) دەرگا یا کەلەبەرێکی سەرگیراو لە زەمینەی ژوور یا کەشتیدا.

(٣) دەرگا یا سەرقاپی ئەم کەلەبەرە.
(٤) دەرگای لافاو دابینکردن لە بەنداو یا رووباردا.
(٥) تۆری ماسی گرتن
**hatchery** (hach'ēr-i), *n.* شوێنی هێلکە هەڵهێنان بەتایبەتی هی مریشك و باڵندەی ترو ماسی.
**hatchet** (hach'it), *n.* تەشوێ
**bury the hatchet,** شەڕ وەستاندن؛ ئاشتبوونەوە.
**dig** ( or *take*) **up the hatchet,** شەڕ هەڵگیرساندن؛ جەنگان؛ جەنگ کردن.
**hatchetman** (hach'it-mən), *n.* پیاوکوژی بەکرێ گیراو.
**hatchway** (hach'wā'), *n.* دەرگا یا کەلەبەرێکی سەر داپۆشراوی زەمینەی کەشتی یا خانوویەك
**hate** (hāt), *v.t. & v.i.* رق لێ بوون؛ قین لێ بوون
*n.* (١) رق؛ قین. (٢) کەسێك یا شتێکی قین لێ بوو
**hateful** (hāt'f'l), *adj.* (١) کینە بە دڵ؛ رقاوی؛ قیناوی؛ قین لەبەر.
(٢) بۆگەن؛ پیس؛ بافتی رق لێ بوونە؛ ناپەسەند.
**hath** (hath), *archaic third person singular, present indicative, of* have.
**hatred** (hā'trid), *n.* رق؛ قین؛ ناحەزی
**haughtiness** (hô'ti-nis), *n.* لووت بەرزی؛ لەخۆبایی بوون؛ کەشخەچیتی؛ ترزل؛ ترزلێتی
**haughty** (hô'ti), *adj.* لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ کەشخەچی؛ ترزل؛ بەفیز؛ فیر زل
**-haughtily** *(adv.)*.
**haul** (hôl), *v.t.* (١) راکێشان؛ بە کێش کردن
(٢) کێش کردن بە ئوتومبیل، شەمەندەفەر، وولاخ... هتد؛ گواستنەوە:
*( He ~s coal for a living.)*
(٣) گۆڕینی ڕێبازی کەشتی (بە بایەوانەکانی)
*v.i.* (١) راکێشان (٢) روو گۆڕین (با).
*n.* (١) راکێشان (٢) دەسکەوتی یەك جاری راو (تۆری ماسی).
(٣) ماوە یا دووری راکێشان: *( a long ~ )* .
(٤) باری گوێزراوە یا کێش کراو.
**haul off,** (١) رووی کەشتی گۆڕین (بۆ ئەوەی لە شتێك نەدات).
(٢) خۆکشانەوە؛ کشانەوە. (٣) [Colloq.]، دەست هێنانە دواوەو گورج بەستەوە پێش زللەلێدان
**haunch** (hônch, hänch), *n.* (١) پشەن؛ کەفەل؛ قنگ.
(٢) رانە گۆشت. (٣) پایەی تاق (خانووسازی).
**haunt** (hônt, hänt), *v.t.* (١) هەمیشەو زوو زوو چوونە شوێنێك (مرۆڤ، خێو). (٢) پەستکردن بە شوێن کەوتن و لەکۆڵ نەبوونەوە
(٣) زوو زوو هاتنە یادو پەستکردن: *( Memories ~ed her.)* .
(٤) تێدابوون؛ خێو یا یادی رابوردوو تێدابوون:
*( Memories of a happier past ~ the house.)*
*n.* (١) (أ) هەوارگا؛ پەناگا (چایخانە، سەرکۆڵان، بار... هتد).
(ب) لانە؛ لەوەرگا؛ مۆڵگە. (٢) [Dial.]، خێو.
**haunted** (hôn'tid, hän'tid), *adj.* خێوی تێدایە؛ خێونشین.
*( a ~ house)*
**hautboy** (hō'boi, ō'boi), *n.* ( Also *hautbois* ), = **oboe.**
**hauteur** (hō-tūr'), *n.* لووت بەرزی؛ فیزرل؛ لەخۆبایی بوون؛ ترزلی
**have** (hav), *v.t.* (١) هەبوون؛ بوون؛ هەیەتی؛ پێ بوون؛ خاوەن بوون.
*( He has money.; I ~ a house.)*
(٢) تێدابوون *( The week ~ seven days.)* .
(٣) تووش بوون (نەخۆشی)؛ هەبوون: *( The children ~ measles.)* .
(٤) دەربەسەر (کات)؛ رابواردن؛ چەشتن: *( H~ a good time.)* .
(٥) زانین: *( He has no knowledge of the matter.)* .
(٦) را ووتن؛ را گێرانەوە؛ را بڵاوبوون: *( Gossip ~ it that...)* .
(٧) هێنانە ژێر دەستی خۆوە؛ بوون بە هی خۆ
(٨) خواردن و خواردنەوە؛ جگەرەکێشان:
*( to ~ dinner, a drink, a cigarette)*
(٩) منداڵبوون: *( to ~ a baby)* .
(١٠) بوون؛ کردن؛ رووداں لە بەیندا:
*( We had an argument, a fight, etc.)*
(١١) کردنی کارێك؛ داواکردن بۆ کردنی شتێك:
*( Please ~ this done at once.)*
(١٢) هەبوون (بە خاوەنێتی نا): *( We ~ a talkative neighbour.)* .
(١٣) رێگەدان؛ هێشتن: *( I won't ~ this nonsense.)* .
(١٤) [Colloq.]، بەسەردا زاڵبوون؛ دابینکردن:
*( I had my opponent now.)*
(١٥) [Colloq.]، دەستبرین؛ خەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن:
*( They've been had in that business deal.)*
(١٦) هەروەها ووشەی " **have** " بەکاردەهێنرێت وەك کرداری یاریدەدەر بۆ دەربڕینی کارێکی تەواوکراو:
*( I ~ left.; I had left.; I shall ~ left.; I would ~ left.)*
(١٧) هەروەها بەکاریش دەهێنرێت لەگەڵ چاووگ دا بەمانای "پێویستە":
*( I ~ to go.; He has to do it.)*
*n.* [Colloq.], دەوڵەمەند؛ خۆش گوزەران (مرۆڤ، وولات، چین):
*( the ~s and the ~- nots)*
**had better,** پێویستە؛ وا چاکە.
*( You had better go now.)*
**had rather** ( or **sooner** ), بەلاوە باشتربوون؛ پێ باشتربوون.
*( Had rather make love than war.)*
**have at,** هێرش بردنەسەر؛ پیادان؛ پیاماڵین؛ لێدان.
**have done,** تەواوکردن؛ تەواوبوون؛ لێ بوونەوە؛ وەستان.
**have it in for,** [Colloq.], رقی کۆن لێ بوون؛ کینە لە دڵدا بوون دژی.
**have it out,** برینەوە یا خستن بەلایەکی ناکۆکیدا بە شەڕ یا گفتوگۆ.
**have on,** لەبەردا بوون (جل).
**have to do with,** پەیوەندی پێوەبوون.
**haven** (hā'v'n), *n.* (١) بەندەر. (٢) لانە؛ پەناگا.
*v.t.* (١) هێنانە بەندەر (کەشتی)؛ خستنە بەندەرەوە.
(٢) لانە پێدان؛ داڵدەدان؛ جێکردنەوە؛ پەناپێدان؛ گرتنەخۆ.
**have-not** (hav'not'), *n.* [Colloq.], کەسێك یا وولاتێکی بێ دەرامەت یا نەبوو.
**haven't** (hav''nt), = **have not.**
**havoc** (hav'ək), *n.* وێرانکاری (جەنگ، لافاو، گەردباو، بوومەلەرزە)؛ وێران کردن؛ کاول کردن
*v.t.* [Obs.], وێران کردن؛ کاول کردن.
**play havoc with,** وێران کردن؛ کاول کردن؛ خاك بە توورەکە بێژانەوە.
**haw** (hô), *n.* (١) گوێژ. (٢) دار گوێژ
**haw** (hô), *interj. & n.* خورین بەسەر ئەسپ و گا و وولاخی تردا بۆ پێچکردنەوە بەلای چەپدا.
*v.t. & v.i.* پێچکردنەوە بەلای چەپدا.
**haw** (hô), *v.i., n. & interj.* منگەمنگ کردن (دووان)؛ زمان گیران:
*( to hem and ~ )*
**hawk** (hôk), *n.* (١) هەڵۆ؛ واشە. (٢) کەسێکی دەستبڕ یا فێڵباز.
(٣) کەسێکی شەڕپەرست، شەڕانی، یا جەنگاوەر.
*v.i.* (١) راوکردن بە هەڵۆ. (٢) راوکردن بە خۆپیادان و بەسەرەوە نیشتنەوە وەك واشە.
*v.t.* پەلاماردانی نێچیر وەك واشە.
**hawk** (hôk), *v.t. & v.i.* (١) ووردەفرۆشی کردن لەسەر شەقامەکان و هاوارکردن؛ چەرچێتی کردن. (٢) قاوخستنەوە.
**hawk** (hôk), *v.i.* قورگ پاککردنەوە (بە کۆکین).

*v.t.* بەلغەم فڕێدان

*n.* قورگ پاککردنەوە؛ کۆکەی دەنگ بەرز

**hawker** (hôk'ẽr), *n.* ووردەفرۆشی گەڕۆك؛ چەرچی

**hawk-eyed** (hôk'īd'), *adj.* چاوتیژ

**hawksbill** (hôks'bil'), *n. Also* **hawksbill turtle.** کیسەڵی دەریایی

**hawse** (hôz), *n.* (١) ئەو بەشەی پێشی کەشتی کە کونی تێدایە بۆ گوریسی لەنگەرهاویشتن. (٢) کونی گوریسی وەها. (٣) ماوەی بەینی پێشی کەشتی و لەنگەرەکانی. (٤) باری گوریسی ئاسنی لەنگەرخستن.

**hawsehole** (hôz'hōl'), *n.* کونی پێشەوەی کەشتی بۆ گوریسی لەنگەر

**hawser** (hô'zẽr), *n.* گوریسی ئاسنینی لەنگەری کەشتی.

**hawthorn** (hô'thôrn'), *n.* دارگوێز؛ گوێژ

**hay** (hā), *n.* گزرە؛ یووش؛ کا

*v.i.* گزرەخستن؛ گزرەکردن.

*v.t.* (١) کا پێدان؛ گزرە پێدان (٢) گیا بەخێوکردن بۆ گزرە. (٣) گزرەخستن؛ گزرەکردن

**hit the hay,** [Slang]. چوونەناو جێگا؛ نوستن.

**make hay,** گزرەخستن

**make hay while the sun shines,** هەل لە دەست خۆ نەدان؛ ئەوپەڕی سوود وەرگرتن لە هەلێك

**hay fever,** نەخۆشییەکە نیشانەکانی پژمین و قوڕگ و چاو و دەموچاو خورانەو لووت ئاوکردنە.

**hayfork** (hā'fôrk'), *n.* (١) سێلك؛ شەن. (٢) مەکینەی گزرە بارکردن

**hayloft** (hā'lôft'), *n.* کایەن؛ هەورەبانی گزرەو کا.

**haymaker** (hā'māk'ẽr), *n.* (١) گزرەخەر؛ گزرەکەر. (٢) [Slang]. مستەکۆڵەیەکی توند.

**hayrack** (hā'rak'), *n.* (١) ئاخور (٢) چوارچێوەی سەردەرهێناو لە دوی واگۆنی گزرە گواستنەوەوە (بۆ گزرە زیاتر هەڵگرتن). (٣) واگۆنی گزرەکێشان

**hayride** (hā'rīd'), *n.* گەشتێکی کورتە بە لۆری یا واگۆنێك کە زەمینەکەی گزرە یا پووشی لەسەر دانرابێ.

**haystack** (hā'stak'), *n.* بەستەکی گزرە؛ کۆمەڵە گورزەی گزرە یا پووش؛ شارا؛ خەرمان.

**haywire** (hā'wīr'), *n.* تەل گورزەکردنی گزرە.

*adj.* [Slang]. (١) شێواو؛ تێکچوو. (٢) شێت؛ سەرشێت *( to go ~ )* .

**hazard** (haz'ẽrd), *n.* (١) جۆرە یاری یا قومارێکە بە زار دەکرێت (٢) رێکەوت؛ هات‌ونەهات. (٣) مەترسی. (٤) [Archaic]. شتێکی مەترسی لێکراو. (٥) کوسپی یاریگای گۆڵف

**at all hazards,** مەترسییەکەی هەرچەندە بێت.

**hazardous** (haz'ẽr-dəs), *adj.* (١) هات و نەهاتە؛ رێکەوتە. (٢) پڕ مەترسی

**haze** (hāz), *n.* (١) تەم؛ تەمومژ. (٢) لێڵی مێشك؛ سەر لێ شێوان

**haze** (hāz), *v.t.* (١) سزادان و چەوساندنەوەی کەشتییەوان بە کاری قورس و ناپێویست پێ کردن (٢) چەوساندنەوەی قوتابی هاوپۆل بە سەر خستنەسەرو لاقرتێ پێکردنی

**hazel** (hā'z'l), *n.* (١) بستە (٢) داری بستە؛ لقێکی ئەم دارە (٣) رەنگی قاوەیی سووورباو

*adj.* (١) هی داری بستە. (٢) قاوەیی سووورباو؛ قاوەیی سوورو سەوزباو: *( ~ eyes)*

**hazel-nut** (hā'z'l-nut'), *n.* بستە

**haziness** (hā'zi-nis), *n.* (١) تەماوی؛ تەمومژاوی. (٢) لێڵی (مێشك، بیرکردنەوە، بیروباوەڕ)؛ سەر لێ شێوان؛ شێواوی.

**hazy** (hā'zi), *adj.* (١) تەماوی؛ تەمومژاوی. (٢) لێڵ (مێشك، بیرکردنەوە، بیروباوەڕ)؛ سەر لێ شێواو؛ شێواو *( a ~ mind; ~ thinking, ideas, etc.)*

-hazily *(adv.).*

**H-bomb** (āch'bom'), *n.* بۆمبای هایدرۆجینی.

**he** (hē), *pron.* (١) ئەو (پیاو، کوڕ، گیانداری نێرینە، شتێك کە بە نێرینە بناسرێت). (٢) ئەو کەسەی؛ هەرکەس: *( H~ who laughs last laughs best.)*

*n.* پیاو؛ کوڕ؛ گیانداری نێرینە: *( Our dog is a ~ .)* .

**he-** (hē), پێشگرێکە بەمانای: نێرینە: *( ~ -dog)* .

**head** (hed), *n.* (١) سەر. (٢) کەللە؛ کەللەسەر. (٣) مێشك: *( Use your ~ .)* . (٤) توانا؛ لێهاتوویی؛ زیرەکی: *( He has a ~ for mathematics.)* . (٥) کەس؛ یەکێ: *( dinner at five dollars a ~ )* . (٦) سەر (ئاژەڵ): *( fifty ~s of cattle )* . (٧) شێوەی سەر (پەیکەر، تابلۆ). (٨) ئەو ڕووەی پارەی ووردەیە کە وێنەی سەری تێدا هەڵکەنراوەو پێی دەووترێ: " شێر ". (٩) پۆپ؛ تەوقەسەر؛ لای سەروو: (ا) تەوقەسەر؛ سەر (لاپەڕە، پایە، شێوەی مرۆڤ یا شت). (ب) سەرباس. (ج) گرنگترین بەشی باسێك. (د) کەفی سەر پەرداخە بیرە *( the ~ of a glass of beer)* (هـ) سەری تەپڵ. (١٠) پێشەوەی شتێك یا سەرەکەی. (ا) سەرو (چرپایە)؛ لاسەروو: *( the ~ of a bed, table, etc.)* . (ب) سەری دوور لە زەمینی ئەسکەلە. (ج) پێشی کەشتی؛ ڕووی کەشتی (د) پێشەنگ (لەشکر). (هـ) ئەمسەرو ئەوسەری شتێك. (١١) (ا) سەری دەرزی. (ب) نووکی تیژ. (ج) سەری قەدپاڵ. (د) سەری دەرزی یا گەرمەژنە. (١٢) چەرمی سەر تەپڵ. (١٣) سەرچاوە (ڕوبار، جۆگە). (١٤) تەووژمی ئاو. (١٥) سەرۆك؛ سەرەك؛ سەرکردە؛ سەرگەورە (ماڵ)؛ پێشەوا. (١٦) بەڕێوەبەری قوتابخانە. (١٧) تەقینەوەی تەنگوچەڵەمە: *( Things may soon come to a ~ .)* (١٨) [Slang]. ئاودەستخانە؛ توالێت. (١٩) (ا) سەلك (کەلەرم، کاهو، پیاز). (ب) لق‌وپۆپ (درەخت، ڕووەك؛ (٢٠) سەری ئاسنینی داری یاری گۆڵف.

*adj.* (١) سەرەکی؛ یەکەم. (٢) پێشەوە؛ هی پێشەوە یا پێشەنگ.

*v.t.* (١) سەرۆکی کردن؛ سەرکردەیی کردن؛ سەرۆکایەتی کردن. (٢) لە سەرەتاوە بوون؛ یەکەم بوون: *( She ~s the list.)* . (٣) سەر بۆ درووستکردن. (٤) [Rare]. سەربڕین. (٥) لق و پۆپ کردن. (٦) بە دەوری سەرچاوەدا ڕۆیشتن. (٧) ڕۆیشتن یا لێخوڕین بەرەو: *( I ~ed the car for home.)* . (٨) لە تۆپ دان بەسەر (یاری فوتبۆڵ).

*v.i.* (١) هەڵقوڵان (ڕوبار). (٢) گەورەبوون و بوون بە سەلك (کەلەرم، کاهو) (٣) ڕۆیشتن بەرەو؛ چوون بۆ: *( They ~ed home)* .

**come to a head,** (١) گەیین (دوومەڵ) (٢) تەقینەوە (تەنگوچەڵەمە)

**give a head,** [Slang], بۆ مژین یا لستنەوە (پیاو وژن).

**go to one's head,** (١) سەرخۆش کردن؛ هێنانە جۆش؛ سەر لێ شێواندن. (٢) هەست بە زل کردن؛ خۆ بە زل دانان.

**hang ( or hide ) one's head,** سەرشۆڕکردن (شەرمەزاری).

**head and shoulders above,** زۆر باشتربوون لە (مرۆڤ).

**head off,** (١) بەرەو بڕی دانەوە. (٢) ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتن.

**head over heels,** (١) سەرمەوقولات دان. (٢) زۆر؛ تەواو؛ یەکجار. (٣) بە هەڵەشەیی؛ بە بێباکی؛ بە پەلە.

**heads up!** [Colloq.], ووریا بە!؛ ئاگات لە خۆت بێ!.

**keep one's head,** خۆ نەشڵەژاندن؛ خۆ تێك نەدان؛ بە ژیری و هێمنی مانەوە

**keep one's head above water,** (١) سەرناوکەوتن؛ نوقم نەبوون (٢) ئاگا لە خۆ بوون و نەکەوتنە ژێر قەرزەوە.

**lay heads together,** راوێژ بەیەکتر کردن؛ تەگبیرکردن؛ پیلان دانان پێکەوە

**lose one's head,** شڵەژان؛ سەر لێ تێکچوون؛ سەر لێ شێوان

**make head or tail of,** سەر لێ دەرچوون؛ تێگەیشتن.

(ئەم رستەیە بەزۆری لە باری " نەفی " یا " نەکردن " دا بەکاردەهێنرێت. واتە بە مانای ' سەر لێ دەرنەچوون " یا " تێ نەگەیشتن "):

***( I can't make head or tail of it.)***

**out of ( or off ) one's head,** [Colloq.]. شێت

**over one's head,** (١) زۆر قورس یا گران؛ تێگەیشتنی زەحمەتە (٢) چوونە لای پلەیەکی بەرزتر (سکاڵاکردن).

**put heads together,** راوێژکردن تەگبیرکردن؛ پیلان دانان بەیەکەوە.

**take it into one's head,** هاتن بە خەیاڵدا؛ بیرلێکردنەوە

**turn one's head,** (١) گێژکردن. (٢) لەخۆبایی بوون.

**headache** (hed′āk′), ***n.*** (١) سەرئێشە؛ ژانەسەر (٢) [Colloq.]، دەردی سەری؛ چەرمەسەری؛ مەراق؛ ناخۆشی؛ گێچەڵ.

**headband** (hed′band′), ***n.*** (١) سەرپێچ (شریت یا قایش). (٢) نەقشی سەرەتای بەندی پەرتووکێك.

**headboard** (hed′bôrd′, hed′bōrd′), ***n.*** تەختەی لاسەرووی چرپایە

**heddress** (hed′dres′), ***n.*** (١) سەرپێچ؛ کڵاو و جامانە یا مشکی. (٢) شێوەی قژداهێنان و رێکخستن.

**-headed** (hed′id), پاشگرێکە بەمانای: (١) مێشکێکی تایبەتی هەیە: ***( clearheaded)*** (٢) چەند سەرێکی هەیە: ***( two-headed)*** .

**headfirst** (hed′fŭrst′), ***adv.*** (١) بەسەردا (مەلەکردن. کەوتنە خوارەوە. (٢) بە هەڵەشەیی؛ بە بێباکانە.

**headgear** (hed′gêr′), ***n.*** (١) سەرپێچ؛ کڵاو؛ تەپلە؛ شەپقە؛ کڵاوی ئاسن. (٢) قایش و قرووش و گێژوگولنگی سەری ئەسپ و ماین.

**heading** (hed′iŋ), ***n.*** (١) سەرووتار. (٢) تونێلی کانگە

**headless** (hed′lis), ***adj.*** (١) سەربڕاو؛ بێ سەر (٢) بێ سەرکەورە؛ بێ سەرۆك. (٣) بێ مێشك؛ کەر

**headlight** (hed′līt′), ***n.*** چرای ئۆتۆمبیل، شەمەندەفەر، یا سەر تەوەری کەشتی.

**headline** (hed′līn′), ***n.*** (١) سەردێر؛ سەرووتار (رۆژنامە، دەنگوباس). (٢) کورتەی دەنگوباس.

***v.t.*** (١) سەرووتار بۆ نووسین یا دانان (٢) بڵاوکردنەوە لە شوێنێکی زۆر دیاردا

**headlong** (hed′lôŋ′), ***adv.*** (١) بەسەردا؛ بە سەرمەوقولات؛ سەرەبەرەوخوار. (٢) بەخێرا و بە قایم. (٣) بە هەڵەشەیی؛ بە بێباکی.

***adj.*** (١) لێژ. (٢) بەسەردا؛ سەرەبەرەوخوار. (٣) خێراو قایم. (٤) هەڵەشە؛ بێباك.

**headman** (hed′mən), ***n.*** (١) سەرۆك؛ سەرکردە؛ سەرکار؛ چاودێر. (٢) [Rare]، پیاوکوژ.

**headmaster** (hed′mas′tēr, hed′mäs′tēr), ***n.*** بەڕێوەبەری قوتابخانە (پیاو)

**headmistress** (hed′mis′tris), ***n.*** بەڕێوەبەری قوتابخانە (ژن).

**headmost** (hed′mōst′), ***adj.*** یەکەم؛ لەپێش هەمووشتێکدا؛ لەپێشەوە

**head-on** (hed′on′), ***adj. & adv.*** بەسەردا؛ ***( a ~ collision)*** .

**head-phone** (hed′fōn′), ***n.*** بیستۆك. بێ بیست

**headpiece** (hed′pēs′), ***n.*** (١) سەرپێچ؛ کڵاو؛ کڵاوی ئاسنین؛ شەپقە. (٢) بیستۆك. (٣) مێشك؛ سەر. (٤) نەقشی سەرەتای پەرتووکێك یا بەندێکی.

**headquarters** (hed′kwôr′tērz), ***n.pl.*** (١) بارەگا (حیزب، رێکخراو، سوپا، دەزگای بازرگانی... هتد)؛ سەرشار. (٢) فەرمانبەران و کاربەدەستانی بارەگا.

**headrest** (hed′rest′), ***n.*** پاڵپشتی سەر.

**headset** (hed′set′), ***n.*** بیستۆك.

**headship** (hed′ship′), ***n.*** سەرۆکایەتی؛ پلەی سەرۆك

**headsman** (hedz′mən), ***n.*** (١) پیاوکوژ (بە سەربڕین). (٢) [Rare]، سەرۆك؛ سەرکردە.

**headspring** (hed′spriŋ′), ***n.*** سەرچاوە.

**head-stall** (hed′stôl′), ***n.*** لغاو؛ رەشوە؛ ئەو بەشەی لغاو یا رەشوە کە دەکرێتە سەری ئەسپ و ماین.

**head start,** دەستپێکردنی کێ برکێیەك لەپێش کەسانی تردا

**head-stone** (hed′stōn′), ***n.*** (١) بەردی بناغە. (٢) کێل؛ کێلە قەبر.

**headstrong** (hed′strôŋ′), ***adj.*** سەرکێش؛ سەرپێچ؛ سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ سەرڕەق

**head-waiter** (hed′wāt′ēr), ***n.*** سەرۆك بەردەستان (چێشتخانە).

**headway** (hed′wā′), ***n.*** (١) بۆ پێشەوە. (٢) پێشکەوتن (کار، پرۆژە)؛ سەرکەوتن. (٣) بۆشایی ژوور سەر (دەرگا، تونێل). (٤) ماوەی کات یا دووری نێوان دوو شەمەندەفەر یا کەشتی کە بەهەمان رێگەداو هەمان رووداو برۆن

**head wind,** بای بەرەو رووی کەشتی یا فڕۆکە.

**head-work** (hed′wŭrk′), ***n.*** کاری مێشك؛ بیرکردنەوە

**heady** (hed′i), ***adj.*** (١) هەڵەشە؛ بێباك (٢) سەرخۆشکەر ***( ~ wine)*** .

**heal** (hēl), ***v.t.*** (١) چاککردنەوە (بە دەرمان)؛ چاککردنەوە: ***( to ~ the sick)*** (٢) سارێژ کردن (برین). (٣) لە خەم و خەفەت و ناخۆشی و دەردی سەری رزگارکردن. (٤) ئاشتکردنەوە؛ پێکهێنانەوە.

***v.i.*** (١) چاکبوونەوە (نەخۆش). (٢) سارێژبوون (برین).

**healer** (hēl′ēr), ***n.*** چاککەرەوە (مرۆڤ، شت): (١) تیمارکەر؛ پزیشك؛ دەرمانکەر. (٢) کەسێك کە بە دوعاونزا نەخۆش چاك دەکاتەوە. (٣) دەرمان

**health** (helth), ***n.*** (١) تەندروستی؛ لەش ساغی. (٢) گەشەکردن؛ پەرەسەندن. (٣) نۆش.

**healthful** (helth′fəl), ***adj.*** (١) سازگار؛ باش بۆ تەندروستی. (٢) [Rare]، تەندروست؛ لەش ساغ.

**healthy** (hel′thi), ***adj.*** (١) تەندرووست؛ لەش ساغ؛ ساغ. (٢) سازگار؛ باش بۆ تەندرووستی: ***( ~ food)*** . (٣) باش و بەهێز و لە پەرەسەندندایە: ***( a ~ economy)*** . (٤) چاك؛ باش: ***( a ~ appetite)*** .

-healthily ***(adv.)***; healthiness ***(n.)***.

**heap** (hēp), ***n.*** (١) کۆمەڵ؛ تۆپەڵ؛ گرد (شتومەك). (٢) [Colloq.]، هەندێکی زۆر؛ زۆر: ***( a ~ of money)*** .

***v.t.*** (١) کۆمەڵ کردن؛ گردکردنەوە؛ تۆپەڵ کردن؛ کەڵەکەکردن. (٢) زۆر پێدان: ***( He ~ed gifts upon me.)*** . (٣) لیپاولیپ کردن.

***v.i.*** کۆمەڵ بوون؛ کەڵەکەبوون؛ گردبوونەوە.

**hear** (hēr), ***v.t.*** (١) بیستن؛ گوێ لێ بوون (٢) گوێ لێگرتن، بەتایبەتی: (أ) گوێ لە داوا گرتن لەلایەن دادگەرەوە: ***( to ~ a case)*** (ب) قایل بوون؛ بەخشین: ***( He ~ed my entreaty.)*** . (ج) گوێگرتن (ئۆپەرا، شانۆنامە، ووتار). (د) رێ ی قسەکردن دان: ***( I cannot ~ you now.)*** .

(۳) ئاگادارکردن؛ پێزانین

*v.i.* (۱) بیستن؛ گوێ لێ بوون. (۲) گوێگرتن.

(۳) ( ~ of; ~ about )، پێزانین؛ بیستن (دەنگوباس).

**hear from,** (۱) نامە یا بروسکە لێوە وەرگرتن؛ تەلەفۆن بۆ کران؛ لێ بیستن. (۲) سەرزەنشت کران.

**hear out,** گوێ لێگرتن هەتا دوایی

**not hear of,** ڕێ نەدان؛ قەدەغەکردن؛ گوێ لێ نەگرتن.

**hearing** (hêr′iŋ), *n.* (۱) بیستن؛ گوێ لێ بوون

(۲) هەستی بیستن

(۳) ڕێ پێدان بۆ قسەکردن و ڕوونکردنەوەی شتێك.

(٤) دادگەری؛ دادپرسین؛ لێکۆڵینەوەی داوا یا سکاڵایەك لەلایەن دادپرس یا لیژنەیەکەوە

(٥) ماوەی دەنگبڕکردن: ( *He is within ~ .* )

**hearken** (här′k'n), *v.i.* گوێ لێگرتن؛ گوێ پێدان؛ سەرنج پێدان بە وردی

*v.t.* [Archaic]. گوێ لێگرتن؛ گوێ پێدان؛ بایەخ پێدان؛ بەقسەکردن.

**hearsay** (hêr′sā′), *n.* ووتەووات؛ قاو؛ قسەی دەماودەم.

**hearse** (hûrs), *n.* تەرم؛ دارە تەرم؛ چواردارە

**heart** (härt), *n.* (۱) دڵ (۲) سنگ

(۳) ناوجەرگە: ( *the ~ of the city* )

(٤) ناوکرۆك (سەوزە)؛ کاکڵ. (٥) گەوهەر؛ ناوەڕۆك؛ پوختە؛ ماك.

(٦) دڵی مرۆڤ؛ سەرچاوەی هەست و نەستێتی، بەتایبەتی:

(ا) ناودڵ؛ دەروون؛ هۆش: ( *I know my ~ .* ).

(ب) سەرچاوەی هەست. (ج) سرووشت: ( *She has a kind ~ .* ).

(د) ووزە؛ تیر؛ وورە: ( *I lost ~ .* ).

(٧) کەسێکی خۆشەویست و ڕێز لێ گیراو: ( *He is a valiant ~ .* ).

(٨) شتێك لە شێوەی دڵدا بێت. (٩) کووپە (کاغەزی قومار).

*v.t.* [Rare], هاندان

**after one's own heart,** چۆن حەز دەکات وەها

**at heart,** لە دڵەوە؛ لەدڵ و دڵەوە؛ لەناو دڵدا.

**break one's heart,** دڵ شکاندن؛ سوێ بوونەوە؛ خەم و خەفەتێکی زۆر پێدان

**by heart,** لەبەر؛ لەبەربوون

( *to know something by heart* )

**change of heart,** دڵ گۆڕین؛ دڵ لێ هەڵکەوتن؛ ڕاگۆڕین

**eat one's heart out,** سوێ بوونەوە؛ دڵ دەرهێنان؛ خەم و خەفەتێکی زۆر خواردن

**from ( the bottom of ) one's heart,** لە ناخی دڵەوە؛ لە کانگای دڵەوە؛ پڕ بە دڵ

**have a heart,** بە ڕەحم بوون؛ هاوسۆزی کردن.

**have one's heart in the right place,** دڵپاك بوون؛ خۆش خواست؛ باش ویست.

**heart and soul,** بە گیان و بەدڵ؛ بە هەموو هێز و توانایەکەوە.

**in one's heart of hearts,** لەناوجەرگەی دڵەوە؛ لە ناخی دڵدا.

**lose heart,** وورە بەردان

**lose one's heart,** حەزلێکردن؛ دڵ پێدان؛ کەوتنە خۆشەویستییەوە.

**near one's heart,** زۆر خۆشەویست؛ زۆر گرنگ.

**set one's heart at rest,** دڵنیابوون

**set one's heart on,** بەتاسەوە بوون بۆ؛ دڵ لێچوون؛ ویستن؛ بەتەمابوون؛ حەزلێکردن.

**take heart,** بڕوا بەهێز بوون؛ هاندران؛ دڵخۆش بوون؛ وورە هاتنەبەر.

**take to heart,** (۱) گرتنەدڵ؛ لە دڵ گرتن؛ خەفەت پێ خواردن؛ پێ پەست بوون. (۲) زۆر بە گرنگ گرتن.

**to one's heart's content,** چەندی ئەوێ ئەوەندە؛ چەند حەز لێ دەکات ئەوەندە.

**wear one's heart on one's sleeve,** هەست زۆر پیشاندان؛ هەست زۆر لەڕوو بوون.

**with all one's heart,** پڕ بەدڵ؛ بەدڵ؛ لە کانگای دڵەوە؛ بە هەموو هێزوتوانایەکەوە.

**with half a heart,** بە نیوە بەدڵی؛ بە نیوە نابەدڵی.

**heartache** (härt′āk′), *n.* خەم و خەفەت؛ خەمباری؛ دڵتەنگی؛ سوێ.

**heartbeat** (härt′bēt′), *n.* دڵ لێدان.

**heartbreak** (härt′brāk′), *n.* سوێ؛ سوێ بوونەوە؛ دڵ شکان؛ خەم.

**heartbreaking** (härt′brāk′iŋ), *adj.* دڵ شکێن؛ خەفەتباراوی؛ زۆر ناخۆش: ( *~ news* ).

**heartbroken** (härt′brō′k'n), *adj.* خەفەتبار؛ خەمبار؛ دڵ شکاو؛ جەرگبڕاو.

**heartburn** (härt′bûrn′), *n.* دڵەکزێ.

**hearten** (här′t'n), *v.t.* دڵ ڕوونکردنەوە؛ هاندان؛ وورەپێدان.

**heartfelt** (härt′felt′), *adj.* دڵسۆزانە؛ لە کانگای دڵەوە؛ ڕاستەقینە.

**heart-free** (härt′frē′), *adj.* بێ دڵدار؛ حەز لە کەس نەکردوو.

**hearth** (härth), *n.* (۱) ئاگردان. (۲) چوارچێوەی ئاگردان.

(۳) ماڵ؛ خێزان.

**hearthside** (härth′sīd′), *n.* (۱) گوێ ئاگردان. (۲) ماڵ؛ خێزان.

**hearthstone** (härth′stōn′), *n.* (۱) بەردی ئاگردان.

(۲) ماڵ؛ خێزان.

**heartily** (här′t'l-i), *adv.* (۱) بە ڕووخۆشی؛ بە ڕووخۆشانە.

(۲) بەدڵ؛ بە جۆشەوە؛ بە گەرم

(۳) بەدڵ (خواردن)؛ زۆر (خواردن): ( *He ate ~ .* ).

(٤) تەواو؛ زۆر.

**heartiness** (här′ti-nis), *n.* پڕ بەدڵی؛ جۆش.

**heartless** (härt′lis), *adj.* (۱) بێ تاقەت؛ بێ وورە؛ ترسنۆك.

(۲) بێ بەزەیی؛ بێ ڕەحم؛ هەست مردوو؛ دڵ مردوو.

**heart-rending** (härt′ren′diŋ), *adj.* جەرگبڕ؛ زۆر ناخۆش.

**heart-sick** (härt′sik′), *adj.* خەفەتبار؛ خەمبار؛ پەست؛ دڵتەنگ.

**heart-stricken** (härt′strik′n), *adj.* خەفەتبار؛ خەمبار؛ پەست؛ دڵتەنگ.

**heart-string** (härt′striŋ′), *n.* (۱) پەڕەی دڵ؛ ژێی دڵ.

(۲) (*pl.*) قووڵترین هەست.

**heart-to-heart** (härt′tə-härt′), *adj.* بە دڵێکی کراوە؛ لەڕوو (دووان): ( *a ~ talk* ).

**hearty** (här′ti), *adj.* (۱) گەرم (بەخێرهاتن): ( *a ~ welcome* ).

(۲) پڕ بەدڵ؛ زۆر: ( *a ~ dislike* ).

(۳) بەهێز و تەندرووست.

(٤) خۆش (خواردەمەنی)؛ باش و زۆر (ژەمە خۆراك): ( *a ~ meal* ).

(٥) زۆر حەز لە خواردن کەر؛ زۆر خۆر؛ باش خۆر: ( *a ~ eater* ).

(٦) بە پیت (زەوی).

*n.* (۱) هاوڕێ؛ برادەر. (۲) (کۆ) کەشتییەوان.

**heat** (hēt), *n.* (۱) گەرما؛ گەرمایی؛ گەرمی؛ تین. (۲) پلەی گەرما.

(۳) گەرما بوون. (٤) ئاووهەوای گەرم.

(٥) گەرمی؛ گەرم کردنەوە (بە گاز یا کارەبا):

( *His rent includes ~ , light, etc.* )

(٦) تیژی (تام، خواردەمەنی)؛ گەرما.

(۷) تا (نەخۆشی).

(۸) هەستی بەهێز (جۆش، تووڕەیی، حەز).

(۹) گەرمە (جەنگ)؛ لە گەرمەی: ( *in the ~ of battle* ).

(۱۰) ئالۆش؛ بەکەڵ بوون؛ بەبا؛ ڕەشەمێ؛ تەڵەب.

(۱۲) [Slang]، (ا) جموجوولێکی زۆر. (ب) زۆرەملێ؛ زۆر؛ زۆردارەکی.

*v.t.* (۱) گەرم کردن؛ گەرم کردنەوە. (۲) هێنانە جۆش؛ هەست جووڵاندن.

*v.i.* (١) گەرم بوونەوە؛ گەرم بوون. (٢) هاتنە جۆش؛ هەست جوولان.

**heater** (hēt′ēr), *n.* (١) زۆپای گەرمی یا گاز؛ ئامێری گەرمکەر؛

گەرمکەر. (٢) [Slang]، دەمانچە.

**heath** (hēth), *n.* (١) دەشتێکی چۆڵ؛ دەشتی بەرەڵا کە هەندێ بنچک و

ڕووەکی تێدا بێ. (٢) ڕووەکێکی دەشتەکی کورتەباڵای گوڵ ئەرخەوانی‌یە.

**heathen** (hē′*th*ən), *n. & adj.* (١) کافر؛ کەسێکی کافر؛ بێ ئاین.

(٢) کەسێکی کێوی؛ کێوی.

**-heathenism** *(n.)*; **heathenry** *(n.)*.

**heathendom** (hē′*th*ən-dəm), *n.* (١) کافرێتی؛ بێ ئاینی.

(٢) وڵات و گەلانی بێ ئاین یا کافر.

**heathenish** (hē′*th*ən-ish), *adj.* (١) کافر؛ بێ ئاین.

(٢) کێوی؛ نەزان.

**heather** (he*th*′ēr), *n.* ڕووەکێکی دەشتەکی کورتەباڵای گوڵ

ئەرخەوانی‌یە.

**heatstroke** (hēt′strōk′), *n.* گەرمابردن؛ خۆرەنگازی.

**heat wave,** (١) گڕە؛ ئاووهەوای زۆر گەرم. (٢) ماوەیەکی وەها.

**heave** (hēv), *v.t.* (١) بەرزکردنەوە بە زەحمەت.

(٢) بەرزکردنەوە و فڕێدان. (٣) سنگ دەرپەڕاندن؛ ئاوساندن؛ دەرپۆقاندن.

(٤) هەنسکدان؛ هەناسە هەڵکێشان؛ ناڵاندن. (٥) ڕاکێشان.

*v.i.* (١) ئاوسان؛ بەرزبوونەوە.

(٢) بەرزونزم بوونەوە (هەنسکدان): ***( His chest ~d with sobs.)*** .

(٣) ڕشانەوە؛ ڕشانەوە هاتن؛ هێڵنج دان. (٤) هەناسەبڕکێ کردن.

(٥) ڕاکێشان. (٦) جووڵان؛ ڕۆیشتن.

*n.* بەرزبوونەوە؛ ئاوسان.

**heaven** (hev′′n), *n.* (١) (کۆ) ئاسمان؛ گەردوون.

(٢) [H-]. خودا (٣) بەهەشت؛ شوێنێکی زۆر خۆش.

(٤) بەختیاری؛ شادمانی؛ کامەرانی. (٥) بەهەشت (ئاین).

**move heaven and earth,** هەوڵدان بە ئەوپەڕی توانا.

**heavenly** (hev′′n-li), *adj.* (١) ئاسمانی؛ گەردوونی.

(٢) زۆر خۆش و پڕ ئاسوودە و جوان (٣) بەهەشتی؛ تایبەتی بە بەهەشت.

**-heavenliness** *(n.)*.

**heavenward** (hev′′n-wērd), *adj. & adv.* بەرەو ئاسمان؛

بەرەو گەردوون

**heavenwards** (hev′′n-wērdz), *adv.* = **heavenward.**

**heaves** (hēvz), *n.pl.* نەخۆشی‌یەکی وڵاخی بەرزەیە بریتی‌یە لە

هەناسە سواربوون و کۆکین.

**heavily** (hev′′l-i), *adv.* زۆر؛ نێجگار زۆر؛ لە ڕادە بەدەر

***( ~ burdened; ~ taxed; ~ populated)***

**heavy** (hev′i), *adj.* (١) قورس (سەنگ)؛ سەنگین.

(٢) ئەستور (قوماش)؛ قورستر لە ئاسایی.

(٣) توند؛ قایم؛ بەهێز: ***( a ~ blow )*** .

(٤) زۆرتر بەشداری کردووە لەوەی چاوەڕوان کراوە (دەنگدان و هەڵبژاردن):

***( a ~ vote )***

(٥) هەڵسا و پڕ شەپۆل (دەریا): ***( a ~ sea )*** .

(٦) دەنگ بەرز و قایم ***( ~ thunder )*** .

(٧) زل و قەبە و ناقۆڵا (ڕوخسار): ***( ~ features )*** .

(٨) لە ڕادە بەدەر: ***( a ~ drinker )***

(٩) گرنگ ***( a ~ responsibility )*** .

(١٠) جەرگبڕ: ***( ~ sorrow )*** .

(١١) گران (ئیش و کار)؛ قورس؛ ناڕەحەت: ***( ~ work )*** .

(١٢) ناخۆش (دەنگوباس): ***( ~ news )***

(١٣) خەمبار (دڵ)؛ پڕ خەم و خەفەت؛ پەست: ***( a ~ heart )*** .

(١٤) خەواڵو: قورس بوو و داکەوتوو (پێڵووی چاو): ***( ~ eyelids )*** .

(١٦) تاڵ (ئاسمان)؛ تاریک؛ لێڵ: ***( a ~ sky )*** .

(١٧) تیژ (بۆن): ***( a ~ odor )*** .

(١٨) ووشک و ناخۆش؛ ناخۆش و بێ تاقەت کەر.

(١٩) ناقۆڵا؛ سست: ***( a ~ walk )*** .

(٢٠) قورس؛ تەپەی لێوە دێت: ***( ~ footsteps )*** .

(٢١) لێژ؛ زۆر لێژ: ***( a ~ grade )*** .

(٢٢) پڕ چەک (سەربان). (٢٣) کارەساتی (شانۆنامە).

*adv.* زۆر؛ نێجگار زۆر

*n.* (١) شتێکی قورس یا گران. (٢) کەس یا ئەکتەرێکی بەد (چیرۆک،

شانۆگەری). (٣) [Colloq.]، کەسێکی بەد و ناپەسەند.

(٤) (ا) دەورێکی کارەساتی لە شانۆنامەیەکدا.

(ب) ئەکتەرێ کە ئەم دەورە ببینێ.

**hang heavy,** بە ناخۆشی و هێواشی دەڕوات (کات).

**heavy with child,** سکپڕ.

**-heaviness** *(n.)*.

**heavy-duty** (hev′i-do͞o′ti, hev′i-dū′ti), *adj.* (١) زۆر بەرگەگر؛

قایم. (٢) گومرگی زۆر لەسەرە.

**heavy-footed** (hev′i-foot′id), *adj.* سست و قورس و ناقۆڵا

(ڕۆیشتن).

**heavy-handed** (hev′i-han′did), *adj.* (١) ناقۆڵا و نەزان.

(٢) زۆردار؛ بێ بەزەیی؛ بێ ڕەحم.

**heavy-hearted** (hev′i-här′tid), *adj.* خەمبار؛ خەفەتبار؛

دڵتەنگ؛ پەست.

**heavy-laden** (hev′i-lād′′n), *adj.* (١) بارقورس؛ بارگران.

(٢) مەراقدار.

**heavy-weight** (hev′i-wāt′), *n.* (١) کەسێک یا گیاندارێکی قورس.

(٢) زۆرانباز یا بۆکسبازێ کە قورسایی لە (١٧٦) پاوەن زیاتر بێت

(٣) [Slang]، کەسێکی زۆر زیرەک، گرنگ، یا بە دەسەڵات.

*adj.* تایبەتی بە کەسانی وەها.

**hebdomad** (heb′də-mad′), *n.* حەوت ڕۆژ؛ هەفتە.

**Hebraic** (hi-brā′ik), *adj.* جوولەکە؛ جوولەکەیی؛ عیبری؛ تایبەتی

بە عیبری‌یەکان و زمان و کلتوورەکەیان.

**Hebraist** (hē′bri-ist), *n.* زانای زمان و کلتووری عیبری؛ عیبری زان.

**Hebrew** (hē′bro͞o), *n.* (١) جوولەکە؛ جوو؛ عیبری‌یەک.

(٢) زمانی عیبری (کۆن و تازە).

*adj.* جوولەکەیی؛ جوولەکە؛ عیبری؛ عیبرانی؛ تایبەتی بە جوولەکە.

**hecatomb** (hek′ə-tōm′, hek′ə-to͞om′), *n.* (١) سەربڕین و کردن

بە قوربانی سەد گا لە یۆنانی کۆندا. (٢) قوربانی‌یەکی زۆر؛ کوشتار؛ قەلاچۆ.

**heck** (hek), *interj.* [Slang], بە جەهەننەم!؛ قیروسیا!.

**heckle** (hek′′l), *v.t.* هووها لێ کێشان (ووتاربێژ، دووێنەر)؛

هەراسان کردن.

**heckler** (hek′lēr), *n.* هووهاکێش؛ هووهاکێشەر.

**hectare** (hek′târ), *n.* هێکتار (کە بریتی‌یە لە دە هەزار دووجا مەتر).

**hectic** (hek′tik), *adj.* (١) سیلاوی؛ سیلدار. (٢) تادار.

(٣) شپرزە و هەمیشە خەریک و ئەرک زۆر و بێ ئارام و سەر هیچ نەپەرژان

***( a ~ day, week, time, etc.)***

*n.* (١) تا (نەخۆشی). (٢) کەسێکی سیلاوی.

**hecto-** (hek′tō, hek′tə), *Also* **hect-,** پێشگرێکە بەمانای: سەدە.

**hectometer** (hek-tə-mē′tēr), *n.* هێکتۆمەتر: سەد مەترە.

**hector** (hek′tēr), *n.* بەچەترسێنکەر.

*v.t. & v.i.* (١) بەچەترسێن کردن. (٢) سەرخستنەسەر؛ پەستکردن.

**he'd** (hēd), = **he had; he would.**

**hedge** (hej), *n.* (١) ڕیزە ڕووەکێک کە بووبن بە پەرژین.

(٢) پەرژین؛ تەیمان؛ کۆسپ.

(٣) پارێز؛ بیمە؛ بەربەست.

*adj.* (١) هی پەرژین؛ پەرژینی.

(٢) نزم؛ سووک؛ بەدزی‌یەوە: ***( a ~ love affair )*** .

*v.t.* (١) پەرژین کردن؛ تەیمان کردن.
(٢) ~ in (؛ دەورەدان (بە پەرژین یا دیوار)؛ پاراستن.
(٣) زیان کەمکردنەوە؛ خۆ لێ لادان (زیان).
*v.i.* (١) خۆشاردنەوە یا پاراستن بە پەرژین.
(٢) خۆ نەدان بە دەستەوە (پرسیاروەڵام)؛ وەڵامی ڕاستەوخۆوتەواو نەدان بەدەستەوە بۆ تێ نەکەوتن. (٣) زیان کەمکردنەوە؛ خۆ لێ لادان (زیان).
-**hedger** *(n.)*; **hedgy** *(adj.)*.
**hedgehog** (hej'hôg', hej'hog'), *n.* ژیشك.
**hedonic** (hē-don'ik), *adj.* (١) خۆش
(٢) تایبەتی بە فەلسەفەی خۆشی پەرستی و خۆشی پەرستان.
**hedonism** (hē'd'n-iz'm), *n.* فەلسەفەی خۆشی پەرستی و کەیف و ڕابواردن پەرستی؛ شاوەت پەرستی.
**hedonist** (hē'd'n-ist), *n.* خۆشی و کەیف و ڕابواردن پەرست؛ کەسێك کە شاوەت پەرستی لە ژیاندا بە باشترین ڕێگە بزانێ.
-**hedonistic** *(adj.)*; **hedonistically** *(adv.)*.
**heebie-jeebies** (hē'bi-jē'biz), *n.pl.* جرت و فرت و بێ ئارامی و شپرزەیی و سەرشێتی و سەرلێدان
**heed** (hēd), *v.t.* گوێ پێدان؛ گوێ لێگرتن؛ بەقسەکردن.
*v.i.* گوێگرتن؛ سەرنجدان؛ بەقسەکردن؛ گوێ ڕایەڵ کردن
*n.* سەرنج؛ گوێ دان؛ گوێگرتن؛ گوێ ڕایەڵ کردن
*( Take ~ of what I say.)*
**heedful** (hēd'fəl), *adj.* گوێ ڕایەڵ؛ گوێگر؛ وریا؛ بەقسەکەر.
**heedless** (hēd'lis), *adj.* بێباك؛ گوێ ڕانەیەڵ؛ گوێ نەگر؛ گوێ نەدەر؛ لامار
**hee-haw** (hē'hô'), *n.* (١) زەڕەی کەر. (٢) قاقای پێکەنینی منداڵانە؛ تریقەی پێکەنین
*v.i.* (١) زەڕین (٢) تریقانەوە؛ قاقای پێکەنین هاتن.
**heel** (hēl), *n.* (١) قنگە پاژنە؛ پاژنەپێ؛ پاژنە. (٢) قنگە پاژنەی گۆرەوی. (٣) پاژنەی پێڵاو. (٤) شتێك کە لە پاژنە بکات لەڕووی جێ و شێوەو ئەرکدا (سەری سەموون، قۆناغە تفەنگ، بنی تەوەرەی کەشتی، دوا دڵۆپی مەی لەبنی شووشەیەکدا ...هتد). (٥) [Slang]، کەسێکی پیس وبۆگەن.
*v.t.* (١) پاژنە بۆ کردن (پێڵاو). (٢) شوێن کەوتن؛ دواکەوتن؛ ڕافڕاندن. (٣) بە پاژنە سەماکردن؛ پاژنە دان لە زەوی. (٤) [Slang]، پارەپێدان. (٥) جنگی ئاسنین کردنە پێی کەڵەشێری شەڕ. (٦) لە تۆپ دان بەسەری دار (یاری گۆڵف).
*v.i.* (١) دواکەوتن؛ شوێن کەوتن زۆر لە نزیکەوە. (٢) بە پاژنە سەماکردن.
**at heel,** زۆر نزیك لە دواوە؛ نزیك لە پشتەوە؛ یەکسەر لە دواوە؛ دوابەدوا.
**cool one's heels,** [Colloq.], چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕێ پێکردن؛ بەنگ کردن
**down at (the) heel,** (١) پاژنەی پێڵاوی سواو. (٢) پەڕپووت؛ کۆن؛ دڕاو؛ شڕ
**kick up one's heels,** لە کەیفدا بوون؛ لە خۆشیدا بوون؛ سەماکردن لە خۆشیدا.
**lay by the heels,** (١) پێوەندکردن؛ کۆت کردنەپێ؛ خستنە بەندیخانە. (٢) بەسەردا زاڵبوون؛ ڕێ لێگرتن.
**on ( or upon ) the heels of,** دوابەدوا؛ یەکسەر لەدواوە.
**out at the heels,** (١) پاژنەی پێڵاو یا گۆرەوی کون تێ بوو. (٢) پەڕپووت؛ دڕاو؛ شڕووڕ.
**show one's ( or a clean pair of ) heels,** ڕاکردن لە ترسدا؛ هەڵهاتن
**take to one's heels,** ڕاکردن لە ترسدا؛ هەڵهاتن.
**to heel,** (١) دوابەدوا؛ یەکسەر لە دواوە. (٢) دابینکراو.
**heel** (hēl), *v.i.* خواربوونەوە بە لایەکدا (کەشتی).
*v.t.* لارکردنەوە بە لایەکدا (کەشتی).
*n.* لاربوونەوە.
**heft** (heft), *n.* [Colloq.], (١) قورسایی؛ قورسی؛ سەنگ. (٢) دەسەڵات؛ دەست ڕۆیشتن. (٣) زۆربەی شتێك یا بەشە زلەکەی
*v.t.* [Colloq.], (١) بەرزکردنەوە. (٢) هەڵسەنگاندن (بە بەرزکردنەوەی شتەکە).
**hefty** (hef'ti), *adj.* (١) قورس؛ سەنگین (٢) زل؛ گەورەو بەهێز.
**hegemony** (hi-jem'ə-ni, hē'ji-mō'ni), *n.* زاڵی (دەسەڵات بوون بەسەر وڵاتێکی تردا)؛ خستنەژێر دەستەوە؛ داگیرکردن؛ دەست بەسەردا کێشان.
-**hegemonic** *(adj.)*.
**heifer** (hef'ēr), *n.* نوێنگین؛ مێ پارێن؛ بەرکەڵ.
**height** (hīt), *n.* (١) ڕۆپ؛ تەوقەسەر؛ لووتکە. (٢) ئەوپەڕ *( the ~ of absurdity)*. (٣) بەرزی؛ بەرزایی (٤) باڵا (مرۆڤ)؛ قەڵافەت؛ درێژی (دارودرەخت) (٥) تاف؛ جۆش؛ گەرمە (شەڕ)؛ هەرەت. (٦) بەرز. (٧) *(pl.)* جێی بەرز؛ بەرزایی؛ بەرزاییەکان. (٨) [Obs.]، پلەوپایەی بەرز.
**heighten** (hīt''n), *v.t.* (١) بەرزکردنەوە؛ بەرزترکردنەوە. (٢) زیادکردن؛ بەتینترکردن؛ تووندوتیژکردن؛ بەتین کردن؛ زۆرکردن *( to ~ a person's pleasure, anger, etc.; to ~ the effect of something)*
*v.i.* (١) بەرزبوونەوە؛ بەرزتربوونەوە. (٢) زیادبوون؛ بەتین بوون.
**heinous** (hā'nəs), *adj.* زۆر ناپەسەند (کردەوە، تاوان)؛ زۆر خراپ؛ بەدوبۆگەن *( a ~ act, crime, deed, etc.)*.
**heir** (âr), *n.* (١) میراتبەر؛ میراتگر؛ بەشبەر؛ خاوەن کەلەپوور. (٢) نەوە؛ وەچە. (٣) جێنشین؛ جێگر.
**heir apparent,** جێنشین؛ جێگر (پاش مردن).
**heirdom** (âr'dəm), *n.* (١) جێنشینی؛ جێگری (٢) میرات؛ کەلەپوور
**heiress** (âr'is), *n.* میراتبەری ژن (بەتایبەتی کچێك یا ژنێك کە سامان و میرایەتییەکی زۆری بۆ مابێتەوە).
**heirloom** (âr'lōōm'), *n.* (١) شتێکی بەنرخە کە میراتبەر بۆی دەمێنێتەوە لەگەڵ میراتەکەیدا. (٢) شتێکی بەنرخە کە لە باوو باپیرانەوە دەمێنێتەوەو هەر لە هۆز یا خێزانەکەدا دەمێنێتەوە.
**heir presumptive,** میراتبەری ئێستا: میراتبەرێکە کە مافی دەفەوتێت ئەگەر خزمێکی نزیکتر بە میرات جێهێڵەرەکە لەدایك ببێت.
**heirship** (âr'ship'), *n.* (١) میراتبەرێتی؛ میراتبەری. (٢) مافی میراتبەری یا جێنشینی.
**held** (held), *past tense and p.p. of* **hold**.
**heli-** (hē'li), = **helio-**.
**helicle** (hel'i-k'l), *adj.* پێچ لوولی.
**helico-** (hel'i-kō'), پێشگرێکە بەمانای: پێچ لوولی.
**helicon** (hel'i-kon', hel'i-kən), *n.* (١) توانای هونەران. (٢) ئامێرێکی مۆسیقاییە.
**helicopter** (hel'i-kop'tēr, hē'li-kop'tēr), *n.* هیلیکۆپتەر.
**helio-** (hē'li-ō'), پێشگرێکە بەمانای: ڕۆژ؛ خۆر؛ تیشکاوەر؛ تیشکدەرەوە.
**heliograph** (hē'li-ə-graf', hē'li-ə-gräf'), *n.* (١) هیلۆگراف: ئامێری وێنەگرتنی ڕۆژ. (٢) ئامێری پێوانی تینی خۆر. (٣) ئامێری برووسکەنێر بە تیشکی ڕۆژ.
-**heliographer** *(n.)*; **heliography** *(n.)*.
**heliolatry** (hē'li-ol'ə-tri), *n.* ڕۆژ پەرستن؛ خۆپەرستی
**heliometer** (hē'li-om'ə-tēr), *n.* (١) تێلیسکۆپی پێوانی تیرەی خۆر. (٢) تێلیسکۆپی پێوانی دووری نێوان دوو ئەستێرە.
**Helios** (hē'li-os'), *n.* خودای خۆر (ئەفسانەی یۆنانی).

**helioscope** (hē′li-ə-skōp′), *n.* تێلیسکۆپی خۆر سەیرکردن بەبێ ئازاردانی چاو

**heliotherapy** (hē′li-ō-ther′ə-pi), *n.* چارەسەرکردنی نەخۆشی بە تیشکی ڕۆژ

**heliotrope** (hē′li-ə-trōp′, hēl′yə-trōp′), *n.* (١) گوڵەبەڕۆژە؛ ڕووەکێك کە هەمیشە ڕوو بکاتە خۆر. (٢) ڕووەکی گوڵ ئەرخەوانی. (٣) ئەرخەوانی سووربار. (٤) ئامێری برووسکەنێر بە تیشکی ڕۆژ.

**helium** (hē′li-əm), *n.* هیلیەم: گازێکی کیمیایی سووکی بێ ڕەنگە.

**helix** (hē′liks), *n.* (١) شتێکی پێچ لوولی؛ پێچ لوول. (٢) کرکراگەی گوێ. (٣) نەقشێکی پێچ لوولی (خانووسازی). (٤) گیانداری ئاوی قاوغ پێچ لوول.

**hell** (hel), *n.* (١) دۆزەخ؛ جەهەننەم (٢) شوێنێك یا بارێکی ناخۆش و ناپەسەندو پڕ ئازارو مەینەتی. (٤) [Colloq.]. بەسەرهات یا ڕووداوێکی ناخۆش و ناپەسەند.

**beat the hell out of,** لێدانێکی زۆر

**catch ( or get ) hell, [Slang],** سەرزەنشت کران؛ سزادران.

**for the hell of it,** هەر بۆ سەیر

**go to hell!** چاوت دەریەت؛ جەهەننەمت لێ پڕ

**raise hell, [Slang].** کردن بە هەرا؛ هەرا هەرا کردن و گێرەشێوێنی نانەوە

**to hell with him,** چاوی دەریەت؛ فیروسیای لێ بێ؛ ملی بشکێ؛ جەهەننەمی لێ پڕ

**what the hell, [Slang],** چی تیایە! چی زیانێکی تیایە! (واتە کردن و نەکردنی شتێك کار ناکاتە سەر هیچ و گرنگ نییە).

**he'll** (hēl), = **he will; he shall.**

**hell-bent** (hel′bent′), *adj.* [Slang], ( ~ on; ~ for ). سوورە- لەسەر (بەتایبەتی کردارێکی هەڵەشانە).

**hell-cat** (hel′kat′), *n.* (١) جادووگەر؛ ئافرەت). (٢) ژنێکی توورەوترۆ و ناپەسەندو بەقین

**Hellene** (hel′ēn), *n.* یۆنانییەك؛ ئیغریقی

**Hellenic** (he-len′ik, he-lē′nik), *adj.* یۆنانی؛ ئیغریقی؛ تایبەتی بە مێژوو و زمان و کلتووری یۆنانی.

*n.* زمانی یۆنانی کۆن

**-Hellenism** *(n.)*; **Hellenist** *(n.)*; **Hellenistic** *(adj.)*.

**hell-fire** (hel′fīr′), *n.* ئاگری دۆزەخ؛ ئاگری جەهەننەم

**hell-hound** (hel′hound′), *n.* (١) سەگی دۆزەخ (٢) (ا) شەیتان (ب) کەسێکی بەدو ناپەسەند.

**hellish** (hel′ish), *adj.* (١) دۆزەخی؛ جەهەننەمی. (٢) شەیتانانە؛ شەیتانی. (٣) [Colloq.]، زۆر ناخۆش و ناپەسەند.

**hello** (he-lō′, hə-lō′), *interj., v.i. & v.t.* هەڵەو (لەسەر تەلەفۆن یا لەکاتی بینینی کەسێکدا وەك سڵاولێکردن).

**helm** (helm), *n. & v.t.* [Archaic & Poetic]. کڵاوی ئاسن

**helm** (helm), *n.* (١) چەرخی لێخوڕینی کەشتی؛ سوکانی کەشتی. (٢) سەرۆکایەتی (حیزب، ڕێکخراو، دەزگا)؛ پایەی سەرۆکایەتی یا ڕابەری.

*v.t.* ڕابەری کردن؛ پێشڕەوی یا سەرۆکایەتی کردن؛ لێخوڕین.

**helmet** (hel′mit), *n.* کڵاوی ئاسن؛ کڵاوزرێ

**helmeted** (hel′mit-id), *adj.* کڵاوی ئاسن لەسەر؛ کڵاوزرێ لەسەر. (٢) لە کڵاوزرێ چوو

**helminth** (hel′minth), *n.* کرمی ڕیخۆڵە

**help** (help), *v.t.* (١) یارمەتیدان؛ یاریدەدان؛ پاڵپشتی کردن؛ لالێکردنەوە؛ دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردن؛ هاوکاری کردن. (٢) چاکردنەوە؛ تیمارکردن: *( This medicine will ~ your cough.)*. (٣) کەڵك بۆ بوون (٤) بەهێزکردن؛ پتەوکردن؛ بەبرەوکردن. (٥) (ا) بەرپرسیاری کردن؛ چاککردن (ڕەوشت)؛ نەهێشتن؛ قەدەغەکردن:

*( I can't ~ his bad manners.)*

(ب) نەکردن؛ ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتن؛ وەستاندن:

*( I can't ~ thinking he's wrong.)*

(٦) بەردەستی کردن.

*v.i.* (١) یارمەتیدان؛ یاریدەدان؛ کۆمەك کردن. (٢) بەردەستی کردن (چێشتخانە).

*n.* (١) یارمەتی؛ یاریدە؛ کۆمەك؛ هاوکاری. (٢) چارە (نەخۆشی)؛ دەرمان. (٣) یاریدەدەر؛ یارمەتیدەر. (٤) کەسێکی بەکرێ گیراو (کارەکەر، وەرزێر، ڕەنجبەر، بەردەس). (٥) نیمچە ژەم؛ ئەو خواردەمەنییەی کە دەخرێتە سەر قاپی نانخواردن

**cannot help but,** چار نەبوون؛ ناچاربوون.

**help oneself to,** (١) خواردەمەنی خواردن یا خستنەسەر قاپی خۆ. (٢) بردنی شتێك بەبێ داواکردنی لە خاوەنەکەی.

**help out,** یارمەتیدان؛ یاریدەدان؛ کۆمەك کردن؛ دەستگرتن.

**help yourself!** فەرموو! فەرموو بخۆ!؛ فەرموو چیت ئەوێ بیکە، بیخۆ، بیبە... هتد.

**so help me God,** خودا شایەتمە (سوێند)؛ خوا شایەتە.

**helper** (hel′pēr), *n.* یاریدەدەر؛ یارمەتیدەر (مرۆڤ، شت)؛ شاگرد؛ هاریکار.

**helpful** (help′fəl), *adj.* بەکەڵك؛ بەسوود؛ سوودبەخش؛ کەڵکدار؛ باش.

**helping** (hel′piŋ), *n.* (١) یارمەتیدان؛ یاریدەدان؛ پاڵپشتی. (٢) ئەو خواردنەی دەخرێتە سەر قاپی خواردن؛ نیمچە ژەم: *( I have had two ~s. )*

**helpless** (help′lis), *adj.* (١) زەبوون؛ داماو؛ لێکەوتە؛ دووچار؛ لاواز؛ هیچی پێ ناکرێ بۆ خۆی. (٢) بێ دەرەتان؛ بێکەس؛ خەریك ماو. (٣) دەستەپاچە؛ بێ دەسەڵات؛ لێ نەهاتوو؛ ناکارامە؛ نەزان.

**helpmate** (help′māt′), *n.* هاودەم و یاریدەدەر (بەتایبەتی ژن و مێرد)؛ هاوسەر.

**helpmeet** (help′mēt′), *n.* = **helpmate.**

**helter-skelter** (hel′tēr-skel′tēr), *adv.* بە شپرزەیی و لامسەرلایی؛ بە شێواوی و بێ سەروقنگی.

*adj.* لامسەرلا؛ شپرزەو شێواوو بێ سەروقنگ؛ بە پەلە پرووسکێ کراو.

*n.* شتێکی بە لامسەرلایی و شپرزەیی کراو؛ شتێکی شێواو؛ چێشتی مجەوەر.

**hem** (hem), *n.* (١) دامێن (جل‌وبەرگ). (٢) پەراوێز.

*v.t.* (١) پەراوێزگرتن؛ دامێن بۆ کردن (جل‌وبەرگ). (٢) ( **~ in; ~ around** ) ئابڵووقەدان؛ دەورەدان؛ دەورگرتن.

**hem** (hem), *interj. & n.* هم؛ همم؛ منجەمنج؛ دەنگی قوڕگ پاکردنەوە (دووان).

*v.i.* (١) منجەمنج کردن. (٢) قوڕگ پاکردنەوە لەکاتی دوواندا.

**hem and haw,** (١) منجەمنج کردن. (٢) وەڵامی تایبەتی نەدان بەدەستەوە لە ووتووێژودوواندا.

**hem-** (hēm, hem), = **hemo- .**

**hema-** (hē′mə, hem′ə), = **hemo- .**

**hematology** (hem′ə-tol′ə-ji, hē′mə-tol′ə-ji), *n.* زانستی خوێن و نەخۆشییەکانی.

**hematoma** (hē′mə-tō′mə, hem′ə-tō′mə), *n.* ئاوساوی خوێن؛ تێزاو؛ دوومەڵێکی پڕ لە خوێن

**hematose** (hem′ə-tōs′, hē′mə-tōs′), *adj.* خوێناوی؛ پڕ لە خوێن.

**hematothermal** (hem′ə-tō-thūr′m'l), *adj.* خوێن گەرم (زیندەوەرزانی).

**hemi-** (hem′i), پێشگرێکە بەمانای: نیو: *( hemisphere)*.

**hemisphere** (hem′ə-sfēr′), *n.* (١) نیوەی سەرزەمین؛

نیوەی جیهان (٢) وڵات و گەلانی نیوەی جیهان.
(٣) ناوچە یا مەودای شارەزایی.
(٤) نیوەی مێشك

**-hemispheric** *(adj.)*.
**hemlock** (hem′lok), *n.* (١) ڕووەکێکی ژەهراوی کوشندەیە.
(٢) ژەهری ئەم ڕووەکە.
**hemo-** (hē′mō, hem′ə), پێشگرێکە بەمانای: خوێن:
*( hemoglobin )*
**hemoglobin** (hē′mə-glō′bin), *n.* هیمۆگلۆبین: سوورایی خوێن
**hemophile** (hē′mə-fīl′, hem′ə-fīl), *n.* (١) کەسێکی - هیمۆفیلیاوی (٢) بەکتریایەکی خوێن خۆشەویستە، واتە کە لەناو خوێندا باش دەژی
**hemophilia** (hē′mə-fil′i-ə, hem′ə-fil′yə), *n.* هیمۆفیلیا: نەخۆشی نەوەستانەوەی خوێن لەبەر نەمەیینی تووشی نێرینە دەبێت.
**hemophiliac** (hē′mə-fil′i-ak, hem′ə-fil′yak), *n.* کەسێکی هیمۆفیلیاوی
**hemophilic** (hē′mə-fil′ik), *adj.* (١) هیمۆفیلیاوی.
(٢) لە خوێندا باش گەورە دەبێت (بەکتریا).
**hemoptysis** (hi-mop′tə-sis), *n.* خوێن هێنانەوە بە تف یا بە کۆکە (لە سییەکان یا بۆری هەواوە).
**hemorrhage** (hem′ēr-ij), *n.* خوێن ڕژان: خوێن بەربوون؛ خوێن لێهاتنێکی زۆر
*v.i.* خوێن ڕژان: تووشی خوێن لێهاتنێکی زۆر بوون.
**hemorrhoid** (hem′ə-roid′), *n.pl.* مایەسیری
**-hemorrhoidal** *(adj.)*.
**hemorrhoidectomy** (hem′ə-roi-dek′tə-mi), *n.* مایەسیری بڕین (پزیشکەوانی)
**hemostasis** (hi-mos′tə-sis), *n.* خوێن وەستانەوە
**hemp** (hemp), *n.* (١) ڕووەکی گوش.
(٢) ڕیشاڵی ئەم ڕووەکە (کە دەکرێت بە گوش و پەت)؛ گوش.
(٣) بەنگ (کە لە گوڵ و گەڵای ئەم ڕووەکە دەردێت)؛ حەشیشە؛ تلیاك.
**hen** (hen), *n.* (١) مریشك؛ مامر؛ مر. (٢) مێینە یا مامری هەندێ باڵندە.
(٣) [Slang]: ئافرەت؛ ژن.
**hence** (hens), *adv.* (١) لێرە؛ لێرەوە؛ دوور لەم شوێنەوە: *( go ~ )*.
(٢) لە ئێستاوە؛ لەمەودوا؛ لەمەولا؛ لە ئێستە بەدواوە: *( a year ~ )*.
(٣) لەم ژیانە یا جیهانە: *( before I go ~ and be no more)*.
(٤) لەم سەرچاوەیەوە. (٥) کەوابوو؛ لەبەرئەمە؛ لەبەرئەوە.
*interj.* لاچۆ لێرە؛ لاچۆ؛ بڕۆ؛ بڕۆ دەرەوە؛ لاچۆ لەبەرچاوم.
**henceforth** (hens′fôrth′, hens′fōrth′), *adv.* ئیتر؛ لەمەودوا؛ لەمەودواوە؛ لەمەولا؛ لە ئێستا بەدواوە
**henceforward** (hens′fôr′wērd), *adv.* = **henceforth.**
**henchman** (hench′mən), *n.* (١) بەردەست؛ خزمەتکار.
(٢) دەسکەلا؛ ژێردەست؛ کلك (مرۆڤ).
(٣) پاڵپشتکەرێکی ڕامیاری کە لە سوودی خۆی دەگەڕێ.
**hencoop** (hen′ko̅o̅p′, hen′koop′), *n.* کولانە مریشك
**henna** (hen′ə), *n.* (١) خەنە (٢) خەنەیی؛ قاوەیی سوورباو.
*adj.* خەنەیی؛ قاوەیی سوورباو.
*v.t.* خەنەلێدان؛ خەنە تێگرتن.
**hennery** (hen′ēr-i), *n.* مریشکخانە؛ جێی پەروەردەکردنی مریشك؛ پەروەردەگای مریشك.
**henotheism** (hen′ō-thi-iz′m), *n.* بڕواکردن بە یەك خودا بەبێ حاشاکردن لە بوونی خودای تر.

**-henotheist** *(n.)*.
**hen party,** [Colloq.], ئاهەنگی ئافرەتان.
**henpeck** (hen′pek′), *v.t.* دەستەمۆکردنی مێرد؛ هەراسان کردن و زاڵی ژن بەسەر مێردەکەیدا.
**henpecked** (hen′pekt′), *adj.* دەستەمۆ (مێرد لەلایەن ژنەکەیەوە)؛ ژێردەستە (مێرد بۆ ژنەکەی)؛ ملکەچ.
**hepat-** (hi-pat′, hep′ət), = **hepato-** .
**hepatitis** (hep′ə-tī′tis), *n.* جگەر ئاوسان؛ نەخۆشی جگەر.
**hepato-** (hep′ə-tō′), پێشگرێکە بەمانای: جگەر؛ تایبەتی بە جگەر.
**hepta-** (hep′tə), پێشگرێکە بەمانای: (١) حەوت.
(٢) حەوت گەردی (کیمیاگەری).
**heptagon** (hep′tə-gon′), *n.* حەوت لا؛ حەوت گۆشە
**-heptagonal** *(adj.)*.
**her** (hūr), *pron.* (١) ئەو (مرۆڤ و گیانداری مێینە و بێ گیانی بە مێ ناسراو): *( They saw ~ .; The engine is all right start ~ now.)*.
(٢) هی ئەو (مرۆڤ و گیانداری مێینە و شتی بێ گیانی بە مێ ناسراو)؛ — ی:
*( ~ hands, ~ voice, ~ hair, ~ purse )*
**herald** (her′əld), *n.* (١) (ا) جاڕدەر (ب) پەیامبەر (بۆ وڵاتانی تر).
(ج) لێپرسراوی مەلەملێ و ئاهەنگ.
(٢) لێپرسراوی نیشانە و دروشمی بەگزادەیی یا خێڵەکی.
(٣) مژدەبەر؛ بڵاوکەرەوە؛ جارچی (ناوی ڕۆژنامە)؛ پەیامبەر.
(٤) پێشەنگ؛ بەرایی؛ نیشانە.
*v.t.* پێش بینین؛ بڵاوکردنەوە؛ نیشانەی ڕوودانی دواڕۆژ بوون؛ مژدەدانی ڕوودانی دواڕۆژ؛ جاڕدان: *( The cocks ~ dawn all night.)*.
**heraldic** (he-ral′dik), *adj.* تایبەتی بە جارچی و پێشەنگ یا نیشانە و دروشمی بەگزادەیی.
**heraldry** (her′əld-ri), *n.* (١) دروشمی خانەدانی، بەگزادەیی، یا سوارچاکی. (٢) فرمانی لێپرسراوی ئەم جۆرە دروشمانە.
(٣) دروستکردن و لێکۆڵینەوەی ئەم دروشمانە.
(٤) ئاهەنگی دابەشکردن و وەرگرتنی دروشمی وەها.
**herb** (ūrb, hūrb), *n.* (١) گیا؛ گژوگیا.
(٢) گیای بۆندار (ڕێحانە، جاترە، پونگە... هتد)؛ گیای دەرمان؛ گیای بۆن خۆش.
**herbaceous** (hēr-bā′shəs), *adj.* (١) گیایی؛ وەك گیای بۆن خۆش؛ تایبەتی بە گژوگیا. (٢) سەوز و گەڵا ئاسا.
**herbage** (ūr′bij, hūr′bij), *n.* (١) گیا؛ گژوگیای لەوەڕگا؛ قەرسیل.
(٢) بەشە تەڕوبڕەکانی گیا کە دەخورێت.
(٣) مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵ لە لەوەڕگای کەسێکی تردا.
**herbal** (hūr′b'l, ūr′b'l), *adj.* تایبەتی بە گژوگیا و گیای بۆن خۆش.
*n.* پەڕتووکی گیای بۆن خۆش و گیای دەرمان.
**herbalist** (hūr′b'l-ist, ūr′b'l-ist), *n.* (١) نووسەری پەڕتووکی گیای دەرمان و بۆندار. (٢) کۆکەرەوە و زانای گیای دەرمان.
**herbarium** (hēr-bâr′i-əm), *n.* (١) چەند نموونەیەك لە گیای وشکی پۆل پۆل کراو و ئامادەکراو بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی.
(٢) گیاخانە؛ شوێنی هەڵگرتنی ئەم نموونە وشکە گیایانە.
**herbicide** (hūr′bə-sīd′), *n.* دەرمانی بژارکوژ.
**-herbicidal** *(adj.)*.
**herbivore** (hūr′bi-vôr′, hūr′bi-vōr′), *n.* گیانداری گیاخۆر.
**herbivorous** (hēr-biv′ēr-əs), *adj.* گیاخۆر.
**Herculean** (hēr-kū′li-ən, hūr′kyoo-lē′ən), *adj.* (١) تایبەتی بە "هێرکیولەس" قارەمانی ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان.
(٢) [h-]، بەهێز و ئازا؛ قارەمان.
(٣) [h-]، زۆر گران (ئەرك)؛ زۆر قورس: *( a ~ task)*.
**herd** (hūrd), *n.* (١) (ا) ڕان (ئاژەڵ)؛ گاگەل؛ مێگەل؛ ئاژاڵ؛ ڕەووك؛ جەلەب. (ب) ڕەوە (گیانداری کێوی): *( a ~ of elephants)*.
(٢) جەماوەر (لەڕووی سووکییەوە)؛ کۆمەڵە خەڵکی بێ ڕای شوێن کەوتوو.
*v.t. & v.i.* کۆمەڵ کردن؛ گردبوونەوە؛ بوون بە یەك وەك ڕانە ئاژەڵ یا جەماوەر.
**herd** (hūrd), *n.* شوان؛ گاوان: *( cow ~, shepherd)*.

**herdsman** (hûrdz′mən), ***n.*** شوان؛ گاوان

**here** (hêr), ***adv.*** (١) لێرەدا؛ لێرە (بۆ دان پیانان):
***( John ~ is a good player.)***
(٢) ئێرە؛ لێرە؛ بۆ ئێرە: ***( Come ~ . )***.
(٣) ئێستا؛ لەم کاتەدا. (٤) لەم سەرزەمینەدا؛ لەم ژیانەدا.
***interj.*** هاوارکردنێکە بەکاردەهێنرێ لە فەرماندانا یا وەڵام دانەوە لەکاتی ناو خوێندنەوەدا.
***n.*** (١) ئێرە؛ لێرە؛ ئەم شوێنە.
(٢) ئێستە؛ لەم ژیانەدا

here and there, (١) لێرەو لەوێ؛ لە هەندێ شوێندا.
neither here nor there, پەیوەندی بە مەسەلەکەوە نییە.

**hereabout** (hêr′ə-bout′), ***adv.*** لەم نزیکانە؛ لەم دەوروپشتە.

**hereabouts** (hêr′ə-bouts′), ***adv.*** = **hereabout.**

**hereafter** (hêr-af′tẽr, hêr-äf′tẽr), ***adv.*** (١) لە ئێستە بەدواوە؛ لەمەولا؛ لە ئێستەوە (٢) لەوەو دنیا؛ لەدوای مردن؛ لە قیامەتدا.
***n.*** (١) دوارۆژ. (٢) ئەوە دنیا؛ ئەوەو دنیا؛ قیامەت.

**hereby** (hêr-bī′, hêr′bī′), ***adv.*** (١) بەمە؛ بەم هۆیەوە؛ لە ڕێی ئەمەوە. (٢) [Obs.] لەم نزیکانە.

**hereditary** (hə-red′ə-ter′i), ***adj.*** (١) بۆماوە (لە باوو باپیرەوە).
(٢) زگماکی؛ زگماک: ***( ~ traits)***.
-**hereditable** ***(adj.)***; **hereditarily** ***(adv.)***.

**heredity** (hə-red′ə-ti), ***n.*** (١) زگماک؛ زگماکی.
(٢) تایبەخۆی زگماکی؛ تایبەخۆی بۆماوە لە باوباپیرەوە.

**herein** (hêr-in′), ***adv.*** (١) لێرەدا؛ لێرە؛ بۆ ئێرە.
(٢) لەم نووسر وەدا. (٣) لەم شتەدا؛ لەم مەسەلەیەدا؛ لەمەدا.

**hereof** (hêr-uv′, hêr-ov′), ***adv.*** دەربارەی ئەمە؛ لەم ڕووەوە

**hereon** (hêr-on′), adv. = **hereupon.**

**here's** (hêrz), = **here is.**

**here's to!** نۆش

**heresy** (her′ə-si), ***n.*** (١) کفر. (٢) ڕایەکی جیاواز لە ڕای زۆری کۆمەڵ یا فەرمانرەوایی لە فەلسەفە یا ڕامیاریدا.

**heretic** (her′ə-tik), ***n.*** کافر.
-**heretical** ***(adj.)***.

**hereto** (hêr-too′), ***adv.*** بەمەوە؛ بەم شوێنە، بروانامە، یا شتەوە:
***( Attached ~ is my report.)***

**heretofore** (hêr′too-fôr′, hêr′tə-fôr′), ***adv.*** لەمەوپێش؛ تا ئێستە.

**hereunto** (hêr′un-too′), ***adv.*** = **hereto.**

**hereupon** (hêr′ə-pon′), ***adv.*** (١) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ؛ دەستبەجێ.
(٢) دەربارەی ئەمە؛ لەم ڕووەوە

**herewith** (hêr-with′, hêr-with′), ***adv.*** (١) لەگەڵ ئەمەدا
(٢) بەم شێوەیە؛ بەم هۆیە

**heritage** (her′ə-tij), ***n.*** (١) میراتی؛ زەوی‌وزارو شتومەکی بۆ جێماو.
(٢) کەلەپوور
-**heritable** ***(adj.)***.

**hermaphrodite** (hẽr-maf′rə-dīt′), ***n.*** (١) نێرەمووک
(٢) کەشتییەکی دوو تەورەیی.
***adj.*** نێرەمووکی
-**hermaphroditic** ***(adj.)***; **hermaphroditism** ***(n.)***.

**hermetic** (hẽr-met′ik), ***adj.*** (١) جادووگەری؛ تایبەتی بە ئەلکەمی واتە کیمیاگەری کۆن. (٢) لەحیم کراو؛ مۆرکراو؛ لوێ کراو.

**hermit** (hûr′mit), ***n.*** (١) وەشکەسۆفی؛ سۆفی؛ قەڵەندەر؛ گۆشەگیر؛ دەروێش. (٢) جۆرێکە لە کێك. (٣) باڵندەیەکی بچووکە وەك فیسقە.

**hermitage** (hûr′mə-tij), ***n.*** (١) قەڵەندەرگا؛ نیشتەجێی وشکە سۆفی. (٢) پەناگا؛ پەنا؛ شوێنێکی چەپە.

**hermitic** (hẽr-mit′ik), ***adj.*** وشکەسۆفیتی؛ قەڵەندەریی؛ تەنهایی؛ چەپ (جێ)

**hernia** (hûr′ni-ə), ***n.*** قۆڕی؛ قۆڕێتی.
-**hernial** ***(adj.)***.

**hero** (hêr′ō), ***n.*** (١) پاڵەوان؛ قارەمان
(٢) قارەمانی هۆنراوە، چیرۆك، یا داستانێك؛ کەسی سەرەکی چیرۆکێك

**heroic** (hi-rō′ik), ***adj.*** (١) قارەمانی؛ پاڵەوانی؛ قارەمانانە:
***( a ~ act)***
(٢) لە بابەت قارەمانێك‌و کردارەکانییەوە: ***( a ~ poem)***.
(٣) پاراوو لە گوتندا زرنگاوە: ***( ~ words)***.
(٤) گەورە (بەرهەمی هونەری) ***( a ~ statue)***.
***n.*** (١) (ا) هەڵبەستی قارەمانی. (ب) (کۆ) هۆنراوەی داستانی.
(٢) ***(pl.)*** وشەی زل‌و بۆش؛ کردەوەی خۆنواندن.
-**heroical** ***(adj.)***; **heroically** ***(adv.)***.

**heroic couplet,** دوو دێری هۆنراوەی پێنج برگەی هاوکێشە.

**heroic verse,** شێوەی هۆنراوەی داستانی.

**heroin** (her′ō-in, hêr′ō-in), ***n.*** هێرۆوین.

**heroine** (her′ō-in), ***n.*** (١) قارەمانی ژن.
(٢) قارەمانی ژنی هۆنراوە، چیرۆك، یا داستانێك

**heroism** (her′ō-iz′m), ***n.*** (١) قارەمانی؛ قارەمانێتی؛ پاڵەوانی؛ پاڵەوانێتی. (٢) کردەوەو ڕەفتاری قارەمانانە.

**heron** (her′ən), ***n.*** شینە شاهۆ؛ شاهۆ

**hero worship,** قارەمان پەرستی.

**herpes** (hûr′pēz), ***n.*** ئاگرە؛ نەخۆشییەکی ئەندامی زاوزێیە.

**herpetic** (hẽr-pet′ik), ***adj.*** تایبەتی بە ئاگرە؛ ئاگرەدار؛ ئاگرە تووش بوو.

**herpetology** (hûr′pi-tol′ə-ji), ***n.*** زانستی ئاگرە.
-**herpetologist** ***(n.)***.

**herring** (her′iŋ), ***n.*** جۆرە ماسییەکە.

**hers** (hûrz), ***pron.*** هی ئەو (ئافرەت یا گیانداری مێینە):
***( a friend of ~ ; That book is ~ . ; H~ are better.)***

**herself** (hẽr-self′), ***pron.*** خۆی (ئافرەت):
***( She went ~ . ; She hurt ~ . )***

**hesitance** (hez′ə-təns), ***n.*** **hesitancy.**

**hesitancy** (hez′ə-tən-si), ***n.*** ڕاڕایی؛ دوودڵی؛ دڵەڕاوکێ؛ گومان؛ سڵ؛ سڵ کردن.

**hesitant** (hez′ə-tənt), ***adj.*** دوودڵ؛ ڕاڕا؛ دڵەڕاوکێکەر.

**hesitate** (hez′ə-tāt′), ***v.i.*** (١) دوودڵی کردن؛ ڕاڕاکردن؛ سڵ کردن؛ سڵ کردنەوە؛ دڵ لەدڵ دان؛ دڵەڕاوکێ کردن. (٢) زمان گیران؛ لاڵ بوون؛ وەك لاڵ قسەکردن
-**hesitater** ***(n.)***; **hesitatingly** ***(adv.)***.

**hesitation** (hez′ə-tā′shən), ***n.*** دوودڵی؛ ڕاڕایی؛ دڵەڕاوکێ؛ سڵ؛ سڵ کردنەوە.
-**hesitative** ***(adj.)***.

**hest** (hest), ***n.*** (١) فەرمان. (٢) بەڵێن.

**hetaera** (hi-têr′ə), ***n.*** (١) دۆست (بەتایبەتی ئافرەتی دیل لە یۆنانی کۆندا). (٢) ئافرەتێکی سەرەڕۆ.

**hetero-** (het′ẽr-ō, het′ẽr-ə), پێشگرێکە بەمانای: تر؛ هی تر؛ جیا.

**heterodox** (het′ẽr-ə-doks′), ***adj.*** لە ڕێباز لادەر (ئاین).
-**heterodoxy** ***(n.)***.

**heterogeneity** (het′ẽr-ō-jə-nē′ə-ti), ***n.*** (١) جیاوازی؛ لەیەك نەچوون. (٢) شتێکی جیاواز.

**heterogeneous** (het′ẽr-ə-jē′ni-əs), ***adj.*** (١) جیا؛ جیاواز؛ نەگونجاو. (٢) هەمەچیزە؛ هەمەچەشنە؛ ناچوونیەك.

**heteronomous** (het′ẽr-on′ə-məs), ***adj.*** (١) ژێردەستە؛

ناسەربەست (٢ جیاواز؛ جیا جیا.

**heteronym** (het′ēr-ə-nim′), *n.* ووشەی هاوحونجە بەلام ماناو بێژە جیا (وەك: دڕاندن: **tear** وە فرمێسك: **tear**).

**-heteronymous** *(adj.).*

**heterosexual** (het′ēr-ō-sek′shōō-əl), *adj.* (١) ئارەزووکەری جووت بوون لەگەڵ توخمی جیا لە خۆدا (نێر لەگەڵ مێ و مێ لەگەڵ نێردا).
(٢) جیا توخم (ژیوارناسی).

*n.* ئارەزووکەری جووت بوون بێ لەگەڵ توخمی جیا لە خۆدا.

**heterosexuality** (het′ēr-ō-sek′shōō-al′ə-ti), *n.* ئارەزوو کردنی حووت بوون لەگەڵ توخمی جیا لە خۆدا (نێر لەگەڵ مێ و مێ لەگەڵ نێر).

**heuristic** (hyoo-ris′tik), *adj.* هاندەری فێربوون و دۆزینەوە؛ هاندەری قوتابی بۆئەوەی خۆی شت فێر بێ و بدۆزێتەوە (شێوەی پەروەردە لە قوتابخانەدا).

**hew** (hū), *v.t.* (١) بڕینەوە (دار، بەرد، کاشی)؛ بڕین؛ لەتکردن؛ داپاچین.
(٢) (**out** ~). داتاشین؛ گەلاڵەکردن؛ نەقاری کردن.
(٣) (**down** ~)، بە تەور بڕینەوە (دارودرەخت)؛ خستن.

*v.i.* پیادان یا لێدان (چەقۆ، تەور... هتد)؛ بڕینەوە.

**hewn** (hūn), *alternative past participle of* **hew**.

*adj.* بڕراوە؛ داپاچراو؛ داتاشراو؛ گەلاڵەکراو.

**hex** (heks), *n.* (١) جادووگەر؛ سیحرباز.
(٢) [Colloq.]. شتێکی بەدووم.
(٣) دوعای خراپ؛ لەعنەت.

*v.t.* [Colloq.], (١) جادوولێکردن.
(٢) دوعای خراپ لێکردن؛ بەدخوازی بۆ کردن.

**hexa-, hex-** (hek′sə), پێشگرێکە بەمانای: شەش.

**hexagon** (hek′sə-gon′), *n.* شەش لا؛ شەش گۆشە.

**-hexagonal** *(adj.).*

**hexagram** (hek′sə-gram′), *n.* (١) ئەستێرەی شەش گۆشەیی.
(٢) شێوەیەکی شەش ڕوویی (ئەندازە).

**hexameter** (hek-sam′ə-tēr), *n.* دێڕێکی شەش بڕگەی هۆنراوە.

**hexangular** (hek-saŋ′gyoo-lēr), *adj.* شەش گۆشەیی؛ شەش گۆشە

**hexapod** (hek′sə-pod′), *n.* گیاندار یا جانەوەرێکی شەش پێ.

*adj.* شەش پێ

**hexapodous** (hek-sap′ə-dəs), *adj.* = **hexapod.**

**hey** (hā), *interj.* هێی دەنگێکە بۆ سەرنج ڕاکێشان، سەرسامی دەربڕین، یا پرسیارکردن؛ نەری (پرسیارکردن)

**heyday** (hā′dā′), *n.* تاف؛ هەرەت؛ ئەوپەر (دەسەڵات، گەنجی، خۆشی ... هتد):

***( in the ~ of youth; in the ~ of his reign, power, etc.)***

**H-Hour** (āch′our′), *n.* ساتی نهێنی دەستپێکردنی هێرشێکی سوپایی

**hi** (hī), *interj.* چۆنی؟؛ ئەم کاتەت باش؛ ڕۆژباش؛ هەلەو.

**hiatus** (hī-ā′təs), *n.* (١) بۆشایی؛ شوێنی بەتاڵ یا بۆش.
(٢) پچڕان؛ بەردەوام نەبوون؛ کەمی؛ کزی.
(٣) وەستانێکی کورت لە بێژانی دوو بڕگە یا ووشەی یەك لەدوای یەکی دەستپێکردوو بە ڤاوڵ یا تیپی دەنگدار:

***( he entered; re-enter; the ear)***

**hibernate** (hī′bēr-nāt′), *v.i.* سڕبوون لە زستاندا (مار)؛ سڕبوون و نەجوولانەوە؛ خۆشاردنەوە و چالاکی نەنوواندن.

**hibernation** (hī′bēr-nā′shən), *n.* (١) سڕبوون لە زستاندا (مار)؛ سڕی؛ سڕبوون (٢) چالاکی نەنوواندن؛ ماوەی چالاکی نەنوواندن:

***( Stirring suddenly from long ~ I know myself once more a poet.)***

**hibiscus** (hī-bis′kəs, hi-bis′kəs), *n.* ڕووەك یا درەختێکی مام ناوەندی‌یە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێت.

**hic-cup, hic-cough** (hik′əp), *n.* نزگەرە.

*v.i. & v.t.* نزگەرەکردن.

**hick** (hik), *n.* [Colloq.], کەسێکی نەزانی چاونەکراوە؛ لادێیی (لەڕووی سووکی‌یەوە)؛ کێوی؛ دەشتەکی.

*adj.* [Colloq.], وەك کەسێکی نەزان یا لادێیی؛ کێوی.

**hickey** (hik′i), *n.* (١) ئامێر. (٢) (ا) ئامێری نوشتاندنەوەی بۆری. (ب) ئامێری ئەلەکتریك گەیێن. (٣) خاڵ. (٤) [Slang]، شوێن گاز یا ماچی دۆستانە (بەتایبەتی بە لاملەوە یا ڕوومەتەوە).

**hickory** (hik′ēr-i), *n.* (١) درەختێکی ئەمەریکی‌یە لە توخمی دارگوێز.
(٢) داری ئەم درەختە کە زۆر جیڕە. (٣) داردەستی ئەم دارە.
(٤) بەری ئەم دارە.

**hid** (hid), *past tense and alternative p.p. of* **hide.**

**hidden** (hid′'n), *alternative past participle of* **hide.**

*adj.* شاراوە؛ نهێنی؛ پەنهانی؛ نەبینراو.

**hide** (hīd), *v.t.* (١) شاردنەوە. (٢) داپۆشین.
(٣) کردن بەژێر لێوەوە؛ کردن بەژێرەوە.
(٤) دەموچاو وەرگێڕان بۆ شاردنەوەی: ***( He ~ his head in shame.)***.

*v.i.* (١) شارانەوە؛ شاردنەوە؛ شارینەوە. (٢) خۆشاردنەوە؛ خۆ داگرتن

**hide** (hīd), *n.* (١) پێستە (خۆشکراو یا خۆش نەکراو)؛ کەوڵ؛ چەرم.
(٢) [Colloq.] کەوڵی مرۆڤ (لەڕووی سووکی یا گاڵتەوە).

*v.t.* (١) کەوڵ کردن. (٢) بیرازکردن؛ فەلاقەکردن؛ کوتان؛ لێدان.

**neither hide nor hair,** هیچ شتێك؛ هیچ

**hide-and-seek** (hīd′ən-sēk′), *n.* چاوشارکێ؛ قەرەقەرە.

**hideous** (hid′i-əs), *adj.* (١) ناشرین. (٢) بۆگەن؛ چەپەڵ؛ پیس؛ بەد؛ ناپەسەند.

-hideously *(adv.).*

**hide-out** (hīd′out′), *n.* پەناگا؛ پەنا؛ لانە؛ جێی خۆشاردنەوە.

**hiding** (hīd′iŋ), *n.* (١) (ا) شاردنەوە؛ شارینەوە.
(ب) شاراوەیی؛ خۆی شاردۆتەوە: ***( in ~ )***.
(٢) لانە؛ پەناگا؛ جێی خۆشاردنەوە.

**hiding** (hīd′iŋ), *n.* [Colloq.], بیرازکردن؛ کوتان؛ فەلاقەکردن.

**hidrosis** (hi-drō′sis), *n.* ئارەق کردن؛ ئارەق کردنەوەیەکی زۆر.

**hie** (hī), *v.i. & v.t.* پەلەکردن؛ خێراکردن.

**hierarch** (hī′ēr-ärk′), *n.* (١) سەرۆکی ئاینی؛ شێخ؛ قەشەگەورە.
(٢) سەرگەورە؛ سەرۆك؛ سەرەك؛ سەردار.

**hierarchical** (hī′ēr-är′ki-k'l), *adj.* بەپێی پلەوپایە؛ بەپێی گەورەوبچووکی.

**hierarchy** (hī′ēr-är′ki), *n.* (١) فەرمانڕەوایی کڵێسە بە بەڕێوەبەرایەتی قەشەکان بەپێی پلەوپایە. (٢) قەشەو کاربەدەستانی دەزگایەکی وەها (٣) کۆمەڵە کەس یا شتی ڕێکخراو بەپێی پلەوپایە.
(٤) ڕێکخستن بەپێی پلەوپایە یا گەورەوبچووکی؛ گەورەوبچووکی
(٥) هەر سێ پلەوپایەی فریشتەکان؛ سەرجەمی فریشتە.

**hieratic** (hī′ə-rat′ik), *adj.* (١) قەشەیی.
(٢) تایبەتی بە نووسینی " هیرۆگلیفی " میسری کۆن.

**hiero-** (hī′ēr-ō), پێشگرێکە بەمانای: پیرۆز.

**hierocracy** (hī′ə-rok′rə-si), *n.* فەرمانڕەوایی قەشەو کڵێسە یا پیاوانی ئاینی تر.

**hieroglyph** (hī′ēr-ə-glif′, hī′rə-glif), *n.* تیپێکی هیرۆگلیفی؛ هیرۆگلیف؛ وێنەیەکی هیرۆگلیفی.

**hieroglyphic** (hī′ēr-ə-glif′ik), *adj.* (١) هیرۆگلیفی؛ تایبەتی بە نووسینی هیرۆگلیفی میسری کۆن. (٢) بە هیرۆگلیفی نووسراو.
(٣) نیشانەیی. (٤) خوێندنەوەو تێگەیشتنی ئاسان نی‌یە؛ سەری لێ دەرناچێ؛ بە زەحمەت دەخوێنرێتەوە.

*n.* (١) وێنە یا تیپی هیرۆگلیفی. (٢) (*pl.*)، نووسینی هیرۆگلیفی.
(٣) نیشانەیەکە کە تێگەیشتنی گران بێت.
(٤) (*pl.*) نووسینێك کە بە گران دەربکرێ یا بخوێنرێتەوە.

-hieroglyphical *(adj.)*; hieroglyphist *(n.)*.

**hi-fi** (hī′fī′), *n.* (١) دەنگ و ئاوازی ساف (رادیۆ، گرامەفۆن).
(٢) ئامێرێکی ئەلەکترۆنی دەنگ ساف

**higgle** (hig′'l), *v.i.* = haggle.

**higgledy-piggledy** (hig′'l-di-pig′'l-di), *adv. & adj.* شێواو؛
بەشێواوی؛ بە ناڕێك و پێکی؛ تێکلاو و پێکلاو.
*n.* شێواوی؛ تێکلاو و پێکلاوی؛ ناڕێك و پێکی.

**high** (hī), *adj.* (١) بەرز؛ بڵند.
(٢) تایبەتی بە ناوچەی گرد و شاخاوی، واتە بەرز: *( H~ German)* .
(٣) لە بەرزاییەوە: *( a ~ jump)* .
(٤) بەرز (پلە)؛ بەرزتر؛ مەزن؛ نایاب
(٥) گەورە (هەڵە، ناپاکی)؛ گرنگ: *( ~ treason)* .
(٦) بەرز؛ پێشکەوتوو: *( ~er mathematics)*
(٧) سەرەك؛ سەرگەورە: *( a ~ priest)*
(٨) زۆر؛ گەورە؛ ئێجگار زۆر: *( ~ stakes)*
(٩) گرانبەها؛ گران: *( ~ prices)* .
(١٠) خۆش گوزەرانی؛ بەرز؛ فەنتازی: *( ~ living)*
(١١) لەخۆبایی؛ لووت بەرز.
(١٢) گەرمە؛ ئەوپەڕ: *( ~ noon)* .
(١٣) بەرز؛ ناساز (دەنگ)؛ تیژ.
(١٤) شاد؛ ئەوپەڕی خۆشی و بەرزی: *( ~ spirits)* .
(١٥) [Slang]. مەست (بە خواردنەوە یا بەنگ)؛ سەرخۆش.
(١٦) ناوچەی دوور لە کەمەرەی زەوی.
(١٧) بەرزترین؛ خێرا (گێڕی ئۆتۆمبیل).
*adv.* زۆر؛ تا پلەیەکی بەرز؛ بەرز؛ ئێجگار؛ باش؛ ڕادەی زۆر:
*( to climb ~ ; to aim ~ ; to search ~ and low for something; to pay ~ ; to live ~ )*
*n.* (١) بەرزایی؛ شوێنێکی بەرز. (٢) گێڕی خێرا یا بەرز (ئۆتۆمبیل).
**fly high,** بەتەمای شتی زۆر و بەرز بوون؛ بۆ شتی بەرز ڕوانین و بەهیوای پێ گەیشتنی بوون.
**high and dry,** (١) لەدەرەوەی ئاودا (کەشتی).
(٢) داماو؛ بێ دەردتان؛ گیرخواردوو؛ بێ دەرامەت؛ بێکەس و تەنها.
**high and low,** هەموو شوێنێك
*( He searched high and low for her but couldn't find her.)*
**high and mighty,** [Colloq.]. لەخۆبایی؛ لووت بەرز؛ بەفیز
**on high,** لە ئاسمانەوە؛ لە بەرزاییەکەوە.
**run high,** قووڵ (هەست)؛ بەهێز و بەجۆش (هەست)

**high-bred** (hī′bred′), *adj.* (١) تۆخم چاك؛ ڕەسەن
(٢) بەرەفتار؛ ڕەوشت جوان؛ نەجیب زادە.

**high-brow** (hī′brou′), *n.* [Slang]. (١) ڕۆشنبیر
(٢) ڕۆشنبیری ساختە.
*adj.* [Slang]. هی ڕۆشنبیر یا ڕۆشنبیری درۆزنە (لەڕووی سووکی و گاڵتەپێکردنەوە).

**high chair,** کورسی بەرزی منداڵ (کە سینییەکی لەبەردەمدایە و شوێنی قاچی هەیە منداڵ نانی لەسەر دەخوات).

**high-class** (hī′klas′, hī′kläs′), *adj.* نایاب؛ نمرە یەك؛ زۆرباش؛ بەرز (هەندێ جار لەڕووی سووکی یا گاڵتەپێکردنەوە بەکاردەهێنرێت).

**high day,** جەژن.

**higher education,** خوێندنی بەرز (کۆلێج و زانکۆ).

**higher-up** (hī′ēr-up′), *n.* [Colloq.]. کەسێکی پلەو پایە بەرزتر.

**high-falutin, high-faluting** (hī′fə-lōō′t'n), *n.* [Colloq]. قسەی زل؛ زمانی فشە و خۆدەرخستن و بۆش
*adj.* تایبەتی بە زمانی وەها.

**high fidelity,** دەنگ و ئاوازی ساف (رادیۆ، گرامەفۆن).

**high-frequency** (hī′frē′kwən-si), *adj.* تەزوو لەرە زۆر (رادیۆ).

**high-grade** (hī′grād′), *adj.* نایاب؛ نمرە یەك.

**high-handed** (hī′han′did), *adj.* زۆردارەکی؛ ئارەزووکاری؛ قەرەقۆشی؛ نابەجێ و لەخۆبایی:
*( a ~ approach to solving problems)*
-highhandedly *(adv.)*; highhandedness *(n.)*.

**high-hat** (hī′hat′), *adj.* [Slang]. (١) تەپڕۆش؛ ڕێك و پێك؛ شیك.
(٢) لووت بەرز؛ بەفیز؛ لەخۆبایی.
*n.* [Slang]. کەسێکی لووت بەرز و لەخۆبایی.

**highjack** (hī′jak′), *v.t.* [Colloq.]. = **to hijack.**

**highjacker** (hī′jak′ēr), *n.* [Colloq.]. = **hijacker.**

**high jump,** بەرزە بازد (مەلەملێی وەرزشی).

**high-land** (hī′lənd), *n.* کوێستان؛ ناوچەی گرد و شاخاوی؛ ناوچەی بەرزایی.

**highlander** (hī′lən-dēr), *n.* کوێستان نشین؛ چیانشین؛ دانیشتووی ناوچەی گرد و شاخاوی.

**high life,** خۆش گوزەرانی؛ های لایف.

**high-light** (hī′līt′), *v.t.* (١) شەوق لێدان؛ ڕووناك کردنەوە
(٢) ڕوونکردنەوە؛ دەرخستن؛ سەرنج بۆ ڕاکێشان (گرنگترین بەشی باسێك).

**highly** (hī′li), *adv.* (١) لە بەرزاییدا؛ بۆ بەرزایی
(٢) بۆ پلەیەکی بەرز؛ لە پایە و پلەیەکی بەرزدا.
(٣) زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ یەکجار؛ تا ڕادەیەکی زۆر.
(٤) بە ڕێزەوە؛ بە پەسەندکراوی. (٥) گرانبەها.

**high-minded** (hī′mīn′did), *adj.* (١) لووت بەرز؛ لەخۆبایی.
(٢) ڕەوشت و هەست و بیروڕا بەرز.

**highness** (hī′nis), *n.* (١) بەرزی؛ بەرزێتی؛ بڵندی.
(٢) [H-]، نازناوی شازادە:
*( His, Her, Your, Royal ~ ; His, Her, Your ~ )*

**high-octane** (hī′ok′tān), *adj.* ئۆکتێنی زۆرە: *( ~ gasoline)* .

**high-pitched** (hī′picht′), *adj.* (١) بەرز و ناساز (دەنگ)؛ تیژ
(٢) بڵند؛ بەرز. (٣) لێژ (سەربان).

**high-powered** (hī′pou′ērd), *adj.* زۆر بەهێز؛ بەدەسەڵات.

**high-pressure** (hī′presh′ēr), *adj.* (١) بەتەوژم؛ قایم؛ بەرگەی تەوژمی زۆر دەگرێت. (٢) سەلمێنەر؛ بە نیمچە زۆرلێکردن (فرۆشتن سەلماندن)؛ تەنگەتاوکەر؛ زۆرکەرەسەر؛ زۆرلێکەر.
*v.t.* [Colloq.]. زۆرلێکردن؛ زۆرکردنەسەر؛ تەنگەتاوکردن.

**high-priced** (hī′prīst′), *adj.* گرانبەها؛ گران.

**high priest,** قەشە گەورە؛ سەرەك قەشە؛ حاخامی گەورە.

**high-proof** (hī′prōōf′), *adj.* پلەی ئەلکحولی بەرزە یا زۆرە

**high-rise** (hī′rīz′), *adj.* تایبەتی بە خانوویەکی بەرزی چەند نهۆمی.
*n.* باڵەخانە؛ خانووی چەند نهۆم.

**high-road** (hī′rōd′, hī′rōd′), *n.* (١) شاڕێ؛ ڕێ و بانی سەرەکی.
(٢) ڕێی ئاسان و یەکسەر و مسۆگەر: *( the ~ to happiness)* .

**high school,** قوتابخانەی ناوەندی؛ قوتابخانەی ئامادەیی.

**high seas,** دەریای بێ خاوەن: ئەو بەشانەی دەریا کە ئەوەندە دوورن لە ووشکانییەوە لەژێر دەسەڵاتی هیچ وڵاتێکدا نین، بەڵکو هی هەمووکەسێکە؛ ناوەڕاستی دەریا.

**high-sounding** (hī′soun′diŋ), *adj.* گەورەنوێن؛ بەدەبدەبە؛ بەشکۆ (ڕاست یا درۆزنە)؛ زل (قسە).

**high-spirited** (hī′spir′it-id), *adj.* (١) ئازا؛ چاونەترس؛ نەبەز؛ بەجەرگ. (٢) بەکەیف؛ بەدەماخ؛ بەجۆش.

**high-strung** (hī′struŋ′), *adj.* زووهەڵچوو (مرۆڤ)؛ هەمیشە بەجۆش؛ هەست توند و تیژ؛ بێ ئارام.

**hight** (hīt), *adj.* [Archaic]. ناوی ئەوەیە؛ پێی دەووترێ.
**hightail** (hī'tāl´), *v.i.* [Colloq.]. بە پەلەپرووزێ ڕۆیشتن؛ لەبڕو بەپەلە دەربازبوون.
**high tea,** ژەمێ خواردنی سووکە لەگەڵ چادا لە پاش نیوەڕۆیەکی زۆر درەنگدا دەخورێت (نەریتێکی ئینگلیزییە).
**high tide,** (١) بەرزاو (دەریا)؛ شەپۆل بەرزی.
(٢) کاتی بەرزاو یا شەپۆل بەرزی.
(٣) پوپ؛ لووتکە؛ گەرمە (کات، کار)؛ هەرەت.
**high time,** (١) هەرەت؛ کاتی خۆیەتی.
(٢) [Slang]، کاتێکی خۆش و پڕ کەیف.
**high-toned** (hī'tōnd'), *adj.* (١) بەرزوتیژ (دەنگ)
(٢) ڕەوشت و بیروباوەڕ بەرز (گەلێک جار بەتەوسەوە یا بەگاڵتەوە).
(٣) [Colloq.]، تەڕپۆش؛ شیک؛ مۆدەپەرست
(٤) [Colloq.]، نایاب؛ زۆر باش
**high treason,** تاوانی هەرەگەورە (دژی وڵاتی خۆ)؛ خیانەت.
**high-water mark** (hī'wô'tēr, hī'wä'tēr), (١) بەرزترین پلەی بەرزاو یا لافاو (٢) نیشانەی ئەم پلەیە. (٣) پۆپ؛ پلەی هەرە بەرز
**highway** (hī'wā´), *n.* شاڕێ؛ ڕێی گشتی؛ ڕێگا؛ ڕێ
**highwayman** (hī'wā´mən), *n.* چەتە؛ جەردە.
**hijack** (hī'jak´), *v.t.* [Colloq.]. (١) ڕووتکردنەوەی ئوتومبیل یا شەمەندەفەر لە ڕێگە. (٢) فراندنی فڕۆکە، کەشتی، شەمەندەفەر، ئوتومبیل لە ڕێگەو بردنی بەزۆر بۆ شوێنێکی دیاریکراو. (٣) دزین (لە مرۆڤ).
(٤) بە زۆرەملێ شت پێ کردن؛ زۆرلێکردن
**-hijacker** *(n.).*
**hike** (hīk), *v.i.* گەڕان بە پێ بە دەشت ودەردا بەتایبەتی بە خێرا بۆ کەیف یا تەندروستی *(to ~ in the country)*.
*v.t.* [Colloq.], (١) هەڵکێشان؛ بەرزکردنەوە: *(~ up your pants.)*.
(٢) بەرزکردنەوە (نرخ)؛ زیادکردن؛ گران کردن.
***n.*** بە پێ گەڕان بە دەشت و دەردا بەتایبەتی بە خێرا بۆ کەیف یا تەندروستی:
*( to go for a ~ )*
**hilarious** (hi-lâr'i-əs, hī-lâr'i-əs), *adj.* فۆشمە؛ زۆر نەنتیکە؛ قۆشمەچی؛ بە جۆش و سەرنج ڕاکێش؛ سەیرخۆش.
**hilarity** (hi-lar'ə-ti, hī-lar'ə-ti), *n.* نەنتیکەیی؛ قۆشمەیی؛ بەجۆش و سەرنج ڕاکێش؛ سەیرخۆشی.
**hill** (hil), *n.* (١) گرد؛ تەپە (٢) کۆمەڵە گڵ.
(٣) کۆمەڵێک گڵ کە تۆوی تێدا دەچێنرێ یا لەدەوری نەمام خڕدەکرێتەوە.
(٤) تۆپەڵە نەمام یا ڕووەکێک کە بنجەکانیان پێکەوە بێت.
***v.t.*** (١) وەک گرد لێکردن. (٢) بە کۆمەڵە گڵ داپۆشین یا دەورگرتن (تۆو نەمام).
**hill-billy** (hil'bil´i), *n.* [Colloq.]. لادێیی (لە ڕووی سووکییەوە)؛ لادێیییەکی هەرێمە خوارووەکانی ئەمەریکا؛ دەشتەکی.
**hillock** (hil'ək), *n.* گردۆلکە؛ تەپۆلکە
**hill of beans,** [Colloq.]. زۆر کەم؛ کەم؛ نەخت؛ هیچ وپووچ
**hillside** (hil'sīd´), *n.* هەدگرد؛ قەدپاڵ؛ پاڵ
**hill-top** (hil'top´), *n.* لووتکە گرد؛ سەرگرد؛ تەوقەسەری گرد.
**hilly** (hil'i), *adj.* (١) گرداوی؛ گرداوی؛ گردەڵان. (٢) لێژ.
**hilt** (hilt), *n.* مشتوو؛ دەسک
***v.t.*** مشتوو بۆ کردن.
**(up) to the hilt,** بەتەواوی؛ هەمووی؛ زۆر (پلە).
**him** (him), *pron.* ئەو (بۆ پیاو و گیانداری نێرینە) (لە باری کارلێکراو یا ووشەی تەواوکەردا)
**himself** (him-self'), *pron.* خۆی (پیاو) بەتایبەتی:
(١) کار لەخۆکردن: *( He hurt ~ . )*.
(٢) دووپاتکردنەوە: *( He ~ wasn't sure.)*.
(٣) باری ئاسایی و تەندروستی خۆی: *( He hasn't been ~ lately.)*.
**hind** (hīnd), *adj.* دواوە؛ پاشوو؛ پشتەوە: *( ~ legs)*.

**hind** (hīnd), *n.* مێ ئاسکێکی سێ ساڵانەو گەورەتر.
**hind** (hind), *n.* ڕەنجبەر؛ وەرزێر یا بەردەستی ئینگلیزیی و ئوسکوتلەندی.
**hinder** (hin'dēr), *v.t.* (١) وەستاندن؛ ڕێ لێگرتن؛ قەدەغەکردن؛ نەهێشتن. (٢) دواخستن؛ ڕاگرتن؛ کۆسپ لەبەردەمدا دانان؛ هێواش کردنەوە.
**hinder** (hīn'dēr), *adj.* پشتەوە؛ دواوە؛ پاشەوە
**hinder** (hīn'dēr-mōst´), *adj.* = **hindmost.**
**hindmost** (hīnd'mōst´), *adj.* دواترین؛ دوا.
**hindquarter** (hīnd'kwôr´tēr), *n.* (١) ڕان (لاشەی مەڕ، گا، گوێرەکە... هتد). (٢) (*pl.*) پاشەڵ؛ کەفەڵ.
**hindrance** (hin'drəns), *n.* کۆسپ؛ قۆرت (مرۆڤ، شت).
**hindsight** (hīnd'sīt´), *n.* (١) پاش بینی؛ پاش بینینی پاش ڕووداوێک. (٢) نیشان (تفەنگ، دەمانچە).
**Hindu, Hindoo** (hin'do͞o), *n.* (١) هیندی؛ هاونیشتمانییەکی هیندستان (٢) هیندۆسی؛ هیندۆسی پەرست.
***adj.*** (١) هی هیندۆسەکان و زمان و کلتوورەکەیان. (٢) هی ئاینی هیندۆسی.
**Hinduism, Hindooism** (hin'doo-iz'm), *n.* ئاینی هیندۆسی
**Hindustani** (hin´doo-stan'i, hin´doo-stän'i), *n.* زمانی هیندستانی؛ زمانی " ئوردو ".
**hinge** (hinj), *n.* (١) ئەنجامە. (٢) جومگە (گیانداری ئاوی).
(٣) تەوەر؛ تەوەرە؛ شتێکی گرنگ کە هەمووشتێکی تری لەسەر بەندە.
*v.t.* ئەنجامەلێدان؛ بە ئەنجامە لێکدان.
*v.i.* (١) هەڵواسران بە ئەنجامە؛ لەسەر ئەنجامە وەستان.
(٢) کەوتنەسەر؛ بەند بوون لەسەر؛ لەسەر وەستان.
hinge on, لەسەر بەنگ بوون (کاروبار)؛ لەسەر وەستان؛ کەوتنەسەر؛ پێوەبەستران (کاروبار): *Everything hinges on her decision.)*
**hinny** (hin'i), *n.* جوانووە ئەسپ و ماین؛ جاشەکەر.
**hinny** (hin'i), *v.i.* حیلاندن.
**hint** (hint), *n.* (١) نیشانە؛ سووسە؛ تیل نیشان؛ سەرنج؛ لاپلار؛ لاتیل. (٢) [Obs.]، هەل؛ هەڵکەوت.
*v.t. & v.i.* نیشانەپێدان؛ بە لاتیل پێ ووتن؛ بە ناڕاستەوخۆیی پێ ڕاگەیاندن.
hint at, بە لاتیل پێ ووتن؛ بە ناڕاستەوخۆ پێ ڕاگەیاندن؛ نیشاندان.
take a hint, تێگەیشتنی لاتیل یا نیشانەیەک و بەپێی ئەوە جووڵانەوە.
**hinterland** (hin'tēr-land´), *n.* (١) ناوچەی دوور لە دەریا؛ ناوچەی ناوەوەی وڵات. (٢) شوێنی دوور لە شار؛ لادێ؛ شوێنی چەپە
**hip** (hip), *n.* (١) سمت؛ کەفەڵ؛ گووپی سمت.
(٢) گۆشەی دوو ڕووی لێژ وەک هی سەربان (خانووسازی).
**hip** (hip), *n.* بەری گوڵە کێوی.
**hip** (hip), *adj.* [Slang], بە ئاگای مۆدەو نەریتی تازەباوی کۆمەڵ؛ تازەباو (کردەوە).
**hipbone** (hip'bōn´), *n.* سمتەجۆڵە.
**hippo** (hip'ō), *n.* [Colloq.], = **hippopotamus.**
**hippocras** (hip'ə-kras´), *n.* شەرابێکی تێکەڵاو بە داودەرمانی بۆن خۆش.
**Hippocratic oath,** سوێندی بوقراتی (کە قوتابیانی پزیشکەوانی دەیخۆن کاتی وەرگرتنی بڕوانامەی دەرچوونیان).
**hippodrome** (hip'ə-drōm´), *n.* (١) مەیدانی پێشبڕکێی ئەسپ و عەرەبانە (یۆنان و ڕۆمای کۆن). (٢) پیشانگای ئەسپ و سیرک و یاری
**hippogriff, hippogryph** (hip'ə-grif´), *n.* ئەعبایەکی ئەفسانەییە سەروباڵی سیسارک و لەش و پاشەڵ و لاقی ئەسپی هەیە.
**hippopotamus** (hip´ə-pot'ə-məs), *n.* ئەسپی ئاوی؛ کەرکەدەنی ئاو؛ گیاندارێکی زل گیاخۆری پێست ئەستووری بێ تووکی ئەفەریقییە لە قەراغی ئاو ڕووباردا دەژی.
**hip roof,** سەربانێکی لالێژی گۆشەدارە.
**hipster** (hip'stēr), *n.* [Slang], کەسێکی مۆدەپەرستی شارەزای نەریتی تازەباوی کۆمەڵ.

**hire** (hīr), *n.* (١) کرێ (مرۆڤ، نامێر) (٢) بەکرێ گرتن.
*v.t.* (١) بەکرێ گرتن (مرۆڤ، نامێر)؛ ڕاگرتن؛ گرتن (پارێزەر):
*( to ~ a laborer, lawyer, etc.)*
(٢) خۆ بەکرێدان: کرێکاری کردن؛ بەکرێدان.
**for hire,** بۆ کرێ (مرۆڤ، نامێر)
**hire out,** کرێکاری کردن؛ بەکرێدان؛ خۆ بەکرێدان.
**hireling** (hīr′liŋ), *n.* کەسێکی بەکرێ گیراو؛ بەکرێ گیراو؛ کرێکار.
*adj.* بەکرێ گیراو.
**his** (hiz), *possessive pron.* (١) هی ئەو (پیاو و گیانداری نێرینە):
*( a friend of ~ ; That book is ~ . ; ~ are better.)*
(٢) هی ئەو (پیاو و گیانداری نێرینە)؛ —ی:
*( ~ hand; ~ books; ~ tail; ~ house)*
**Hispanic** (his-pan′ik), *adj.* ئیسپانی (زمان و گەل و کلتوور).
**hiss** (his), *v.i.* (١) فیشکاندن (وەك مار)؛ فیشکەکردن.
(٢) فیکەلێکردن و فسەفس کردن لەڕووی ڕق و گاڵتەپێکردنەوە.
*v.t.* ناڕەزایی خۆ دەربڕین بە فیکەلێدان و فسەفس کردن.
*n.* فیشکە؛ فسەفس
**hist** (st, hist), *interj.* بێ دەنگ بە!؛ قسە مەکە!؛ گوێ گرە!.
**histamine** (his′tə-mēn′, his′tə-min), *n.* هیستمین: ئارینتەیەکە لە شانەی زیندەوەر و ڕووەکدایە؛ جۆرە دەرمانێکە.
**histology** (his-tol′ə-ji), *n.* (١) زانستی لێکۆڵینەوەی گەردبینی تێشوو یا شانەی زیندەوەر و ڕووەك.
(٢) پێکهاتنی تێشوو یا شانەی زیندەوەرێك.
**historian** (his-tôr′i-ən, his-tō′ri-ən), *n.* (١) مێژووناس
(٢) مێژوونووس
**historic** (his-tôr′ik, his-tor′ik), *adj.* مێژوویی؛ گرنگ؛
گرنگ لە مێژوودا: *( a ~ event)* .
**historical** (his-tôr′i-k'l, his-tor′i-k'l), *adj.* (١) مێژوویی:
*( a ~ document)*
(٢) دەربارەی کەسان و ڕووداوی ڕاستەقینەیە: *( a ~ novel)* .
(٣) ڕاست؛ ڕاستەقینە؛ ئەوەی لە ڕاستیدا ڕوویداوە.
(٤) بە شێوەیەکی مێژوویی؛ بەپێی ڕوودانی مێژوویی: *( a ~ account)* .
**historically** (his-tôr′i-k'l-i), *adv.* (١) بەشێوەیەکی مێژوویی؛ بەپێی ڕوودانی مێژوویی، واتە بەڕیز لە کۆنەوە بۆ تازە.
(٢) لەڕووی مێژوووەوە؛ بەپێی مێژوو
**historicity** (his′tə-ris′ə-ti), *n.* مێژوویێتی: ڕاستێتی شتێك لەڕووی مێژووەوە
**historiographer** (his-tôr′i-og′rə-fẽr), *n.* مێژوونووس (بەتایبەتی یەکێك کە دانرابێت لەلایەن دەزگایەکی ڕەسمییەوە).
**-historiography** *(n.).*
**history** (his′tə-ri, his′tri), *n.* (١) چیرۆك؛ حیکایەت
(٢) مێژوو (٣) ڕابوردوو *( This coat has a strange ~ . )* .
(٤) شتێکی گرنگ (کە شایستەی تۆمارکردن بێ).
**make history,** مێژوو دروستکردن یا نووسین؛ شتێکی مێژوویی یا زۆر گرنگ کردن
**histrionic** (his-tri-on′ik), *adj.* (١) شانۆیی
(٢) خۆدەرخەری؛ لە ڕادە بەدەر خۆنواندنی؛ دەستکرد؛ منداڵانە.
**histrionics** (his′tri-on′iks), *n.pl.* (١) خۆتوواندنی سەر شانۆ.
(٢) خۆنواندن لە کردەوە یا دوواندا؛ ڕەووشت و کردەوەی منداڵانە؛ خۆدەرخەری
**hit** (hit), *v.t.* (١) پیادان؛ بەرکەوتن: *( The car ~ the tree.)* .
(٢) لێدان؛ پیامالین؛ پیاکێشان: *( He ~ her.)* .
(٣) پێکاندن؛ ئەنگاوتن: *( He fired and ~ the deer.)* .
(٤) ( ~ on; ~ against )؛ پیامالین؛ لێدان.
(٥) خراپ کارتێکردن؛ زیان لێدان:
*( The Irish were hard ~ by potato famine.)*
٦) بە ڕێکەوت دۆزینەوە: *( He ~ the right answer.)* .
٧) بەدڵ بوون؛ حەزلێکردن: *( The hat ~ her fancy.)* .
٨) لە تۆپ دان (یاری بێسبۆڵ).
٩) [Colloq.]، کەوتنەڕێ؛ ڕۆیشتن: *( Let's ~ the road.)* .
١٠) [Colloq.]، داوای پارە لێ کردن: *( He ~ me for ten dollars.)* .
١١) [Colloq.]، زۆر خواردنەوە یا کردنی شتێك: *( ~ting the bottle)*
*v.i.* ١) لێدان؛ پیامالین؛ پیاکێشان.
٢) ( **~ against** )، خۆپیادان؛ بەرکەوتن.
٣) ( **~ upon** )، بە ڕێکەوت دۆزینەوە؛ بۆ گەڕان و دۆزینەوە.
٤) لێدانی تۆپ (یاری بێسبۆڵ)
*n.* ١) لێدان؛ لێدانێك؛ بەرکەوتن؛ پێکان؛ ئەنگاوتن؛ پیادان.
٢) پێکادان؛ بەیەکدادان؛ لەیەکدان.
٣) توانجێکی بڕندە؛ تێبینییەك کە لە جێی خۆیدا بێ (لاقرتێ یا دانایانە).
٤) هات؛ بهات؛ بۆ هاتن؛ بەختەوەری.
٥) بەرهەمێکی هونەری بە برەو (فیلم، گۆرانی، پارچە مۆسیقا، پەڕتووك، شانۆنامە): *( The film was a ~ . ; The play was a ~ . )* .
٦) لێدانی تۆپ (یاری بێسبۆڵ).
**hit it off,** گونجان پێکەوە؛ ناسین بۆ یەکەم جار و یەکتری بەدڵ بوون؛ باش هەڵکردن پێکەوە:
*( The two of them hit it off from the start.)*
**hit off,** ١) لاساییکردنەوە.
٢) بە کورتی و بە باشی باسکردن
**hit or miss,** بە لامسەرلایی؛ یا گاڵ دێنێ یا پەموو؛ یا دەیگرێ یا نایگرێ؛ هات و نەهات.
**hit (out) at,** ١) نیشان لێگرتنەوە (مستەکۆڵە، زللە).
٢) هێرش بردنەسەر بە دەم؛ سەرزەنشتکردن.
**hit the hay,** [Slang], چوونە جێ؛ نووستن:
*( I hit the hay at ten o'clock last night.)*
**hit the trail,** [Slang], کەوتنەڕێ؛ ڕۆیشتن.
**hit-and-run** (hit′'n-run′), *adj.* ١) لێدان و ڕاکردن (ئوتومبیلچی).
٢) لێدان و هەڵاتن (شەڕی پارتیزان):
*( the ~ tactic of guerilla warefare)*
**hitch** (hich), *v.i.* ١) شەلین؛ بە هەنگەشەلێ ڕۆیشتن.
٢) بەسترانەوە؛ گیرخواردن؛ ئاڵۆسکان.
٣) پەیزەن بوون (ئەسپ)؛ قاچ لەیەکدان لە ڕۆیشتندا.
٤) [Slang]، پێوەبوون (ژنهێنان و شووکردن)؛ بەسترانەوە: *( to get ~ed)*
٥) [Slang]، دەست ڕاگرتن لە ئوتومبیل بۆ سوارکردن بە خۆڕایی.
*v.t.* ١) ڕاتەکاندن؛ تەکان پێدان؛ هەڵکێشان.
٢) (ا) بەستنەوە؛ پێوەبەستن (بە قولاپ یا زنجیر)؛ گرێدان؛ تونگ کردن.
ب) بەستنەوە بە دوای ئوتومبیل یا عەرەبانەوە؛ پێوەبەستن.
٣) [Colloq.]، ژنهێنان؛ شووکردن؛ بەستنەوە.
*n.* ١) تەکان. (٢) هەنگەشەلێ؛ شەلین.
٣) ئاڵۆسکان؛ کۆسپ؛ قۆرت: *( a ~ in our plans for the picnic)* .
٤) گرێ. (٥) (ا) گیرە. (ب) شتی پێوەبەستن (ئەڵقە، زنجیر، قولاپ).
٦) [Slang]، سواربوونی ئوتومبیل پاش دەست لێ ڕاگرتنی.
٧) [Military Slang]، ماوەی سەربازێتی.
**without a hitch,** بە ئاسانی؛ بەبێ گیروگرفت؛ بەڕەحەتی.
**hitchhike** (hich′līhik′), *v.i.* دەست لە ئوتومبیل ڕاگرتن بۆ سوارکردن بە خۆڕایی.
**hither** (hith′ẽr), *adv.* بۆ ئێرە؛ بەرەو ئێرە؛ لێرە.
*adj.* ئەم لا؛ ئەم لاوە؛ لەم لاوە؛ نزیکتر بە ئێرە.
**hithermost** (hith′ẽr-mōst′), *adj.* نزیکترین (لێرەوە یا بۆ ئێرە).
**hitherto** (hith′ẽr-too′, hith′ẽr-too′), *adv.* ١) تا ئێستە.
٢) [Obs.]. ئێرە.

**hitherward** (hi*th*'ēr-wērd), *adv.* بەرەو ئێرە؛ بۆ ئێرە
**hitherwards** (hi*th*'ēr-wērdz), *adv.* = **hitherward.**
**hit-or-miss** (hit'ēr-mis'), *adj.* لامسەرلا؛ یا گاڵ دێنێ یا پەموو؛
یا دەیگرێ یا نایگرێ: *( a ~ approach to things)* .
**hive** (hīv), *n.* (١) پوورە هەنگ
(٢) کۆمەڵێک خەڵکی هەمیشە کۆششکەری سەرقاڵ
(٣) شوێنێکی سەرقاڵ
*v.t.* (١) هەنگ کۆکردنەوە لە پوورەدا. (٢) هەنگوین کۆکردنەوە لە پوورەدا.
(٣) کۆکردنەوە و هەڵگرتن بۆ دواڕۆژ؛ پاشەکەوت کردن
*v.i.* (١) چوونە ناو پوورە هەنگەوە. (٢) پێکەوە ژیان.
**hives** (hīvz), *n.pl.* لیری ئالۆشاوی یا خوراو؛ لیر.
**hoar** (hôr, hōr), *adj.* (١) سپی (قژ، سەر) (٢) سەرسپی؛ قژ سپی.
(٣) [Dial.]: کۆن؛ کەبرو هەڵهێناو.
*n.* (١) سپێتی (سەر، قژ). (٢) زوقم.
**hoard** (hôrd, hōrd), *n.* شتی هەڵگیراو بۆ ڕۆژی تەنگانە؛ شتومەکی
عەمارکراو بۆ دواڕۆژ
*v.i. & v.t.* هەڵگرتن بۆ ڕۆژی تەنگانە (پارە، ئازووقە)؛ عەمارکردن بۆ دواڕۆژ؛
پاشەکەوت کردن: *( to ~ money, food, etc.)* .
**-hoarder** *(n.).*
**hoarding** (hôr'diŋ, hōr'diŋ), *n.* هەڵگرتن بۆ ڕۆژی تەنگانە (پارە،
خواردەمەنی)؛ عەمارکردن بۆ دواڕۆژ؛ پاشەکەوت کردن.
**hoarding** (hôr'diŋ, hōr'diŋ), *n.* (١) پەرژینێکی دارینی کاتییە
لە دەوری خانوویەکدا کە دروست دەکرێت یا چاک دەکرێتەوە.
(٢) تەختەی بلاونامە؛ تەختەی ئاگادارنامە.
**hoarfrost** (hôr'frôst', hōr'frost'), *n.* زوقم.
**hoarse** (hôrs, hōrs), *adj.* (١) نووساو (دەنگ): گڕ: *( a ~ voice)* .
(٢) دەنگ نووساو؛ دەنگ گڕ.
**hoarsen** (hôr's'n, hōr's'n), *v.t. & v.i.* دەنگ نووساندن؛
دەنگ نووسان؛ دەنگ گڕبوون.
**hoary** (hôr'i, hō'ri), *adj.* (١) سپی (قژ، سەر)
(٢) (ا) سەرسپی؛ بەشکۆ. (ب) بە گەنگەمووی سپی داپۆشراو (گەڵا).
(٣) زۆر پیر؛ کۆن
**-hoariness** *(n.).*
**hoax** (hōks), *n.* کەڵەک؛ گاڵتەبازی؛ گاڵتە؛ ساختە.
*v.t.* گاڵتەبازی کردن؛ کەڵەکچێتی کردن؛ گاڵتەکردن؛ بەفریوبردن.
**hob** (hob), *n.* قەراغی دەرپۆفیوی ئاگردان بۆ شت لەسەر گەرم کردنەوە.
**hob** (hob), *n.* جنۆکە؛ دێوودرنج.
**play ( or raise ) hob,** گێرەشێوێنی کردن
**hobble** (hob''l), *v.i.* شەلین؛ بە هەنگلەشەڵ ڕۆیشتن.
*v.t.* (١) وەها لێکردن کە بە هەنگلەشەڵ بڕوات.
(٢) پێوەندکردن (ئەسپ)؛ بەستنەوەی دوو قاچی ئەسپ پێکەوە بۆنەوەی
ڕانەکات (٣) ڕێ لێگرتن؛ کۆسپ خستنەڕێ؛ بەردەم گرتن.
*n.* (١) هەنگلەشەڵ؛ شەلین. (٢) پێوەند؛ پاشبەند؛ پەت یا گوریسی پێکەوە
بەستنی دوو قاچی ئەسپ. (٣) [Rare]، کێشە؛ بارێکی ناخۆش.
**hobby** (hob'i), *n.* (١) ئەسپێکی مام ناوەندی بەدەماخ.
(٢) [Rare]. ئەسپەدارینەی منداڵان.
(٣) خولیا؛ شتێک کە مرۆڤ خووی پێوە دەگرێ و لەکاتی دەست بەتاڵیدا دەیکات.
**hobby** (hob'i), *n.* بازێکی ئەورووپایی بچووکە
**hobby-horse** (hob'i-hôrs'), *n.* (١) (ا) وێنەی ئەسپێکە سەماکەر
دەیکات بەناو قەدیا لە سەمایەکی ئینگلیزیدا. (ب) ئەم سەماکەرە.
(٢) ئەسپەدارینەی منداڵ (کە بریتییە لە دارێک منداڵ سواری دەبێ و
غارغارێنی پێ دەکات) (٣) ئەسپەدارینەی ڕاژەنین.
(٤) ئەسپەدارینەی چەرخ و فەلەک.
**hobgoblin** (hob'gob'lin), *n.* (١) جنۆکە؛ دێوودرنج (٢) خێو.
**hobnail** (hob'nāl'), *n.* (١) بزمارێکی کورتی سەرپانە دەدرێت لە
بنی پێڵاو. (٢) کەسێکە کە پێڵاوی وەها لەپێ دەکات؛ لادێیی.
*v.t.* بزماری کورتی سەرپان دان لە بنی پێڵاو.
**hobnob** (hob'nob'), *v.i.* (١) پێکەوە خواردنەوە.
(٢) ( **with** ~ )، زۆر برادەرێتی و هاودەمی لەگەڵ کردن.
**hobo** (hō'bō), *n.* (١) کرێکارێکی گەڕۆک.
(٢) کەسێکی بێ لانەی وێڵی بێکاری دەست لە خەڵک پانکەرەوەی گەڕۆک.
**hock** (hok), *n.* ڕەفیسک؛ پێچکە (ئاژەڵ، ڕەشەووڵاخ، وڵاخی بەرزە،
باڵندە).
*v.t.* پەکخستن بە بڕینی ژێی ڕەفیسک.
**hock** (hok), *n.* جۆرە شەرابێکی سپییە.
**hock** (hok), *v.t.* [Slang], خستنە ڕەهنەوە؛ ڕەهن کردن
*n.* ڕەهن؛ بارمتە.
**hockey** (hok'i), *n.* (١) یاری هۆکی (کە لەسەر سەهۆڵ دەکرێ).
(٢) یاری هۆکی (کە لەسەر زەوی دەکرێ)
**hockshop** (hok'shop''), *n.* [Slang], دوکانی شت خستنە ڕەهنەوە
**hocus** (hō'kəs), *v.t.* (١) خەڵەتاندن؛ کەڵەک لێکردن؛ فریودان؛
ساختەلێکردن؛ فێڵ لێکردن. (٢) بەنگ پێدان.
(٣) بەنگ کردنە خواردنەوەوە.
**hocus-pocus** (hō'kəs-pō'kəs), *n.* (١) قسەی بێ مانای جادووگەر
(کە بەکاری دێنێ لە جادووگرتنەوەدا). (٢) فێڵ و تەڵەکەی جادووگەر
(٣) ووتە و کردەوەی هیچ وپووچ بۆ خلافاندن یا سەرنج ڕاکێشان لە فێڵ و
تەڵەکەیەک. (٤) فێڵ و تەڵەکە؛ فریودان؛ ساختە؛ هەڵخەڵەتان.
*v.t. & v.i.* [Colloq.], بە تەڵەکە بردن؛ فریودان؛ خەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن.
**hodge-podge** (hoj'poj'), *n.* (١) چێشتی شلەی هەمەجۆرو تێکەڵاو.
(٢) چێشتی مجەوەر؛ شتی تێکەڵاو و پێکەڵاو و هەمەچێزە.
**hoe** (hō), *n.* پاچەکۆڵە؛ پاچەکۆڵەیەکی دەم پانی کلک درێژە.
*v.t. & v.i.* زەوی هەڵکەندن و خۆش کردن یا بژارکردن بە پاچەکۆڵە.
**hog** (hôg, hog), *n.* (١) بەراز؛ بەرازی ماڵی؛ ماڵۆس؛ خووگ.
(٢) کاوڕێکی نەبڕاوە. (٣) فلچەی پاککردنەوەی ژێرسکی کەشتی.
(٤) [Colloq.]، کەسێکی خۆپەرست و چاوبرسی، زۆر خۆر، یا پیس و پۆخل.
*v.t.* (١) پشت کووڕکردن (وەک هی بەراز).
(٢) یاڵی ئەسپ و ماین بڕین (هەتا هەر کۆتەرەکەی دەمێنێتەوە).
(٣) پاککردنەوەی ژێری کەشتی
(٤) [Slang]، پڕپیاکردن و بردن بە چاوبرسییانە؛ هەموو یا زیاتر لە بەشی
خۆ بردن (خواردەمەنی، شت)
*v.i.* کووڕبوون (وەک پشتی بەراز)؛ چەمینەوە لە ناوەڕاستدا.
**hogfish** (hôg'fish', hog'fish'), *n.* بەرازە ماسی.
**hoggish** (hôg'ish, hog'ish), *adj.* (١) بەرازانە؛ چاوبرسی و
خۆپەرست و زۆرخۆرو پیس وپۆخڵ. (٢) پیس وپۆخڵ؛ چەپەڵ.
**hogshead** (hôgz'hed', hogz'hed'), *n.* (١) بەرمیلێکی زل
(١٠٠–١٤٠ گالۆن دەگرێت). (٢) پێوانەیەکی شلەیە بریتییە لە (٦٣) گالۆن
**hogtie** (hôg'tī', hog'tī'), *v.t.* (١) هەر چوار پێ بەستنەوە؛
دەست و پێ بەستنەوە (٢) [Colloq.]، بەستنەوە؛ لەکارخستن؛
دەست بەستنەوە.
**hogwash** (hôg'wôsh', hog'wäsh'), *n.* (١) بەرماوە (کە دەدرێت
بە بەراز). (٢) قسەی قۆڕ و بێ مانا؛ قسەی هیچ وپووچ.
**hoise** (hoiz), *v.t.* [Obs.], = **hoist.**
**hoist** (hoist), *v.t.* بەرزکردنەوە (بە مەکینە)؛ هەڵبڕین.
*n.* (١) بەرزکردنەوە (بە مەکینە)؛ هەڵبڕین. (٢) جەگی ئەلەکتریکی؛ مەکینەی
شت بەرزکردنەوە. (٣) (ا) ناوەڕاستی تەوەرەی کەشتی. (ب) بەرزی ئاڵا یا
بایەوانێکی شەکاوە.
**hoity-toity** (hoi'ti-toi'ti), *adj.* (١) حولحولی؛ جرپن؛ ڕاڕا.
(٢) لەخۆبایی؛ لووت بەرز.
(٣) تەنگەجیکلانە؛ بۆڵەبۆڵکەر؛ بە هیچ ڕازی نەبوو.
*n.* ڕەووشتی وەها.

**hokey-pokey** (hō′ki-pō′ki), *n.* (١) فێڵو تەڵەکەی جادووگەر.
(٢) دۆندرمەی هەرزانی سەرجادە

**hokum** (hō′kəm), *n.* [Slang]. (١) ڕووداني سەیرو قۆشمەو هەست
بزوێنی شانۆنامەو چیرۆك. (٢) شتی قۆڕو بێ مانا؛ شتی هیچ‌وپووچ.

**hold** (hōld), *v.t.* (١) گرتن (بە دەست، قۆڵ، یا شتی تر).
(٢) (أ) گرتن بۆنەوەی نەڕوات یا ڕانەکات؛ ڕاگرتن: ***( H~ the prisoner.; Will they ~ the train till we get there?)***
(ب) گرتن (بەندیخانە): ***( He was held for a week.)*** .
(٣) گرتن: نەجوولاندنەوە؛ ڕاگرتن: ***( H~ your head on one side.)*** .
(٤) ڕاگیرکردن (تا نەکەوێ)؛ ڕاگرتن: ***( This pillar ~s the platform.)*** .
(٥) گرتن (زمان، دەم) ***( H~ your tongue.)***
(٦) بەرایی گرتن؛ وەستاندن؛ بەرهەڵستی کردن؛ ڕێ پێ نەدان؛ ڕێ لێگرتن.
(٧) ڕاگرتن (سەرنج): ***( The speaker held their attention.)*** .
(٨) (أ) بۆ هەڵگرتن (پارە، شت).
(ب) بۆ گرتن؛ بۆ هەڵگرتن (وە نەدان بە کەسی تر):
***[ H~ the seat ( the reservation) for me. ]***
(٩) بەستنەوە بە بەڵێنەوە: ***( H~ him to his word.)*** .
(١٠) هەبوون؛ لە پلەوپایەیەکدا بوون؛ گرتنەدەست (کار):
***( He ~s the office of mayor.)***
(١١) پاراستن؛ نەدان بە دەست دوژمنەوە: ***( H~ the fort.)*** .
(١٢) گرتن (کۆڕ، کۆبوونەوە، پۆلی قوتابخانە)؛ پێکهاتن:
***( to ~ a meeting, class, etc.)***
(١٣) گرتن (کۆڕی دادگا): ***( The judge will ~ the court today.)*** .
(١٤) جێ تیابوونەوە؛ گرتن (دەفر، ژوور، هۆڵ، ئوتومبیل... هتد):
***( This bottle ~s a quart.; This room ~s ten people.; The plane ~s two hundred passengers.)***
(١٥) ڕا وا بوون؛ بڕوا وا بوون
***( I hold your statement to be untrue.; to ~ an opinion)***
(١٦) وا دانان ***( to ~ a person responsible for something)*** .
(١٧) خۆشویستن؛ ڕێز بۆ بوون: ***( to ~ one dear)*** .
(١٨) بڕیاردان (دادگا)
(١٩) بەستنەوە بە قۆنتەراتەوە (٢٠) خاوەن بوون.

*v.i.* (١) نەگۆڕان؛ دەست لێ بەرنەدان: ***( H~ on to your resolution.)*** .
(٢) بەرگەگرتن؛ نەپچڕان: ***( The rope held.)*** .
(٣) بە درووست یا ڕەوا دانران؛ کارپێکران.
***( This principle ~s in any government.)***
(٤) بەردەوام بوون: ***( The wind held from the north.)*** .
(٥) خۆگرتن (لەبەر هێرشدا). (٦) وەستان

*n.* (١) گرتن؛ شێوەی گرتن؛ بە دەست گرتن. (٢) دەسك.
(٣) شتێك کە دەستی پێوە دەگیرێ بۆ پاڵپشت. (٤) دەفر.
(٥) گرە؛ مەنگەنە (٦) دەسەلات؛ دەست بەسەرا ڕۆیشتن:
***( His wife has a firm ~ over him.)***
(٧) ژووری بەندیخانە
(٨) [Archaic]. سەنگەر؛ قەڵا.
(٩) وەستانێکی سەردەمی

**catch hold of,** گرتن؛ دەست پیاگەیشتن

**get hold of,** (١) گرتن؛ دەست پیاگەیشتن (٢) دەسکەوتن؛ پەیداکردن
(٣) دۆزینەوە؛ دەسکەوتن:
***( to look for and get hold of somebody)***

**hold back,** (١) جڵەوگرتن؛ ڕێ لێگرتن (٢) خۆڕاگرتن؛ خۆگرتن.
(٣) هێشتنەوە؛ گلدانەوە

**hold down,** (١) دابین کردن؛ خستنە ژێردەستەوە؛ وەستاندن؛
ڕێ پێ نەدان (نرخ بەرزبوونەوە، ئازادبوون)
(٢) [Colloq.]، هەبوون و لەسەرمانەوە (کار)؛ کار گرتنەدەست و لەسەری
مانەوە. ***( to hold down a job)***

**hold in,** (١) ڕاگرتن؛ جڵەوگرتن؛ ڕێ لێگرتن؛ دابینکردن.
(٢) دان بەخۆدا گرتن؛ هەستی خۆ دەرنەبڕین؛ زمانی خۆ گرتن؛ گرتن (هەناسە).

**hold off,** (١) خۆ دوورگرتن؛ دوورەپەرێز وەستان.
(٢) چاوەڕێ کردن؛ دواخستن: ***( Hold off for a minute.)*** .
(٣) بەرگری کردن؛ بەرهەڵستی کردن؛ لە دوورەوە ڕاگرتن (دوژمن)

**hold on,** (١) دەست لێ بەرنەدان؛ بەرنەدان؛ دەست پێوەگرتن؛
بەرەڵا نەکردن. (٢) بەردەوام بوون لەسەر؛ کۆڵ نەدان.
(٣) [Colloq.]، ڕاوەستە!؛ بووەستە!؛ چاوەڕێ بکە!؛ هێواش کە؛ پەلە مەکە.

**hold one's own,** لە خەڵك دوانەکەوتن؛ لەگەڵ حەریفی خۆدا دەرچوون
یا دەربردن و جێ نەمان

**hold out,** (١) دەربردن؛ بەرگەگرتن؛ خۆگرتن؛ کۆڵ نەدان؛ بەردەوام بوون
(٢) مل نەدان؛ خۆ نەدان بە دەستەوە؛ بەرهەڵستی کردن.
(٣) پێشکەش کردن؛ پێدان؛ درێژکردن (دەست بۆ تەوقەکردن).
(٤) [Slang]، نەدان؛ پێ نەدان؛ بەدەستەوەنەدان؛ مل نەدان

**hold over,** (١) دواخستن (تێڕوانینی مەسەلەیەك و چارەکردنی).
(٢) مانەوە بۆ ماوەیەکی نەختێك زیاتر؛ هێشتنەوە؛ هێڵانەوە
(٣) ڕاگرتن بەسەر سەرەوە (هەڕەشە).

**hold together,** یەککرتن.

**hold up,** (١) ڕاگرتن (تا نەکەوێتە خوارێ)؛ پاڵپشتی کردن (کۆڵەکە).
(٢) پیشاندان؛ خستنەڕوو. (٣) دەربردن؛ بەرگەگرتن؛ کۆڵ نەدان.
(٤) دواخستن؛ ڕێ لێگرتن؛ وەستاندن؛ کۆسپ لەبەردەمدا دانان.
(٥) ڕووتکردنەوە؛ ڕاگرتن و ڕووتکردنەوە.

**hold water,** بڕواپێکران؛ خۆڕاگرتن لەبەر تاقیکردنەوەو لێکۆڵینەوەدا؛
جێی بڕوابوون: ***( Your argument doesn't hold water.)***

**hold with,** (١) ڕا لەسەربوون؛ پەسەندکردن. (٢) لایەن گرتن.

**lay ( or take ) hold of,** (١) گرتن؛ وەرگرتن؛ توند گرتن بە دەست.
(٢) دەست بەسەرا گرتن؛ دەست بەسەرا کێشان

**hold** (hōld), *n.* خانەی بار (کەشتی)

**holdall** (hōld′ôl′), *n.* جانتای ڕێبوار.

**holdback** (hōld′bak′), *n.* (١) کۆسپ؛ قۆرت؛ لغاو.
(٢) قایش یا شیشی بەستنی ئەسپ بە عەرەبانەوە.

**holden** (hōl′d'n), *archaic past participle of* **hold.**

**holder** (hōl′dẽr), *n.* (١) (أ) خاوەن یا کەسێکە شت لەدەستدابوو (چەك، سەنەد، کومپیالە). (ب) خاوەن (زەوی)؛ کەسێك کە شتێکی بەدەستەوە بێ
(زەوی‌وزار): ***( land ~ )*** .
(ج) کرێچی؛ گرێ گرتە.
(٢) (أ) بگر؛ هەڵگر؛ شتێك کە شتێکی تری تێ بخرێ (دارجگەرە، مۆمدان)
(ب) بگر (مرۆڤ). (ج) دەزگر؛ دەستگر.

**holdfast** (hōld′fast′, hōld′fäst′), *n.* (١) بەتوند دەست پێوەگرتن.
(٢) گیرە؛ مەنگەنە.

**holding** (hōld′iŋ), *n.* (١) زەوی‌وزاری بەکرێ گیراو.
(٢) (*pl.*) سامان (کومپیالە، سەنەد، بەش لە کۆمپانیای بەشگەدا)
(٣) گرتنی قەدەغەی یاریکەر لە وەرزش یا ملەملێدا لەلایەن یاریکەرێکی ترەوە

**hold-over** (hōld′ō′vẽr), *n.* [Colloq.], هێڵراوە؛ کەسێك کە
دەهێڵرێتەوە یا دەمێنێتەوە لەسەر کار زیاتر لە ماوەی یاسایی

**hold-up** (hōld′up′), *n.* (١) وەستان؛ بەنگ کردن؛ دواخستن؛ ڕاگرتن.
(٢) ڕووتکردنەوە؛ وەستاندن و ڕووتکردنەوە.

**hole** (hōl), *n.* (١) کون؛ چاڵ: ***( He dug a ~ in the ground.)*** .
(٢) کەنداو. (٣) قووڵایی ناو ڕووبار: ***( a swimming ~ )*** .
(٤) لانە (گیاندار).
(٥) شوێنێکی بچووك و تاریك و پیس و ناخۆش (ژوور، خانوو).
(٦) ژووری بەندیخانە.
(٧) درز؛ کەلەبەر؛ کون: ***( a ~ in the wall)*** .
(٨) کون (جل‌وبەرگ)؛ دڕاوی.
(٩) ناتەواوی؛ کەم‌وکورتی؛ نابەجێیی:

*( We found ~s in his argument.)*
(١٠) [Colloq.]. بارێکی ناخۆش و تەریقکەرەوە؛ تەنگوچەڵەمە.
(١١) (ا) کون (یاری گۆڵف)
(ب) دەوروبەرو ماوەی بەینی کونەکانی یاری گۆڵف
*v.t.* (١) کون تێکردن؛ کونکردن؛ کەلەبەر تێکردن؛ درزتێکردن؛ دڕاندن.
(٢) خستنە کونەوە؛ کردنە کونەوە.
(٣) هەڵدرین (تونێل)؛ کونکردن؛ کوناودەرکردن.
**burn a hole in one's pocket,** خۆ نەگرتن و پارەکە هەموو خەرج کردن (دەڵێی گیرفانەکەی کون دەکات ئەگەر خەرجی نەکات).
**hole in the wall,** شوێنێکی بچووک و تەنگەبەرو ناخۆش.
**in the hole,** [Colloq.], قەرزار؛ لەدواوە؛ لەژێرەوە:
*( I'm fifty dollars in the hole.)*
**pick holes in,** کەموکووری دەرخستن؛ ناتەواوی پیشاندان؛ رەخنەلێگرتن

**holiday** (hol′ə-dā′), *n.* (١) جەژنێکی ئاینی؛ ڕۆژێکی پیرۆز.
(٢) ڕۆژی پشوو (وەك هەینی).
(٣) *(pl)* [Chiefly British]، پشوو؛ ماوەی پشوو.
(٤) ڕۆژێکی پشوو کە تەرخانکراوە بۆ یادکردنەوەیەك.
*( George Washington's birthday is a ~ in the US.)*
*adj.* وەك هی ڕۆژی جەژن یا پشووە؛ خۆش و بە کەیف: *( the ~ spirit)* .

**holiness** (hō′li-nis), *n.* (١) پیرۆزی؛ پیرۆزێتی.
(٢) [H-]، نازناوی پاپایە: *( His H~ ; Your H~ )* .

**holler** (hol′ẽr), *v.i. & v.t.* بانگ کردن؛ هاوارکردن؛ قیژاندن.
*n.* بانگ؛ هاوار؛ قیژە

**hollow** (hol′ō), *adj.* (١) بۆش؛ پووچ؛ کلۆر؛ ناوکلۆر؛ پووت؛ قرپۆل.
(٢) چاڵ؛ قوپاو. (٣) قوون *( ~ cheeks)* .
(٤) پڕوپووچ؛ بێ بایەخ؛ هیچوپووچ؛ بۆش؛ بێ مانا؛ بێ نرخ.
(٥) برسی
(٦) دەنگێکی مردوو؛ قووڵ و نەزرنگاوە (دەنگ): *( a ~ voice)* .
*n.* (١) کلۆر؛ کلۆری؛ کون؛ بۆشی؛ چاڵ؛ چاڵایی؛ قوپاوی. (٢) دۆڵ؛ شیو.
*v.t. & v.i.* بۆش کردن؛ هەڵکەندن؛ پووچ کردن؛ پووچ بوون؛ چاڵ کردن.
**hollow out,** هەڵکەندن و دەردان؛ بۆش کردن؛ ناو دەرهێنان.
**-hollowly** *(adv.)*; **hollowness** *(n.)*.

**holly** (hol′i), *n.* (١) درەخت یا دەوەنێکی هەمیشە سەوزی گەڵا بریقاوەو قەراغ دڕکاوییە بەرەکەی لە شیلانی وورد دەچێت. (٢) گوڵ و گەڵاو بەری ئەم درەختە (بۆ ڕازاندنەوە لە کریسمەسدا بەکاردەهێنرێت).

**Hollywood** (hol′i-wood′), *n.* (١) شاری هۆلیوود (کە بە مەڵبەندی سینەماگەری ئەمەریکاو جیهان ناسراوە). (٢) سینەماگەری.

**holo-** (hol′ō, hol′ə, hō′lə), پێشگرێکە بەمانای: هەموو؛ گشت؛ تەواو.

**holocaust** (hol′ə-kôst′), *n.* (١) قوربانییەکی سووتێنراو.
(٢) لەناوبردنی خەڵك و گیاندار بە سووتاندن؛ وێران کردن بە ئاگر؛ بەرپاکردنی گەلێك کەس بە ئاگر (٣) بەرپاکردن؛ وێران کردن؛ وێران بوون؛ فەوتانی گشتی و تەواو.

**holograph** (hol′ə-graf′, hol′ə-gräf′), *adj.* بە دەستی دانەرەکەی نووسراوە.
*n.* بڕوانامە، نامە، یا وەسیەتنامەیەك کە بە دەستی دانەرەکەی نووسرابێت.

**holster** (hōl′stẽr), *n.* کیفی دەمانچە
*v.t.* خستنە کیفەوە.

**holt** (hōlt), *n.* [Archaic], بێشەلان؛ گردێکی دارودرەختاوی

**holy** (hō′li), *adj.* (١) پیرۆز؛ دەپەرسترێت.
(٢) خواپەرست؛ بەئاین؛ پیرۆز (مرۆڤ)؛ پاك: *( a ~ man)* .
(٣) شایستەی پەرستنە. (٤) تایبەتی بە عیساو بەسەرهاتی ژیانی.
(٥) [Slang]. تەواو؛ بە تەواوی؛ زۆر؛ نێجگار: *( She's a ~ terror.)* .
*n.* پەناگایەکی پیرۆز؛ شتێکی پیرۆز

**Holy Communion,** شێوی پیرۆز: باوو نەریتێکی خاچ پەرستییە بریتییە لە خواردنی پارچە نانێکی بچووك کە قەشە لە شەرابی پیرۆزی هەڵدەکێشێ.

**holy-day** (hō′li-dā′), *n.* جەژن (ئاینی).

**Holy Father,** باوکی پیرۆز؛ نازناوی پاپایە.

**Holy Ghost, Holy Spirit,** گیانی خودا (خاچ پەرستی).

**Holy Roman Empire,** ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز (لە سەدەی نۆ یا دەوە هەتا ساڵی ١٨٠٦).

**Holy Rood, holy rood,** (١) ئەو خاچەی عیسای پێوە هەڵواسرا.
(٢) خاچ.

**Holy Scripture, = the Bible.**

**Holy See,** پاپا؛ پاپایەتی؛ پلەو دەسەڵاتی پاپا.

**Holy Sepulcher,** گۆڕی عیسا.

**Holy Spirit, = the Holy Ghost.**

**Holy Synod,** کۆڕ یا ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرایەتی کڵێسەی ئەرسەزۆکسی، واتە ڕۆژهەڵاتی.

**Holy writ, = the Bible.**

**hom-** (hōm, hom), = **homo-**.

**homage** (hom′ij, om′ij), *n.* (١) (ا) ئاهەنگی کڕنووش بۆ بردنی کشتیارو وەرزێرو دەستوپێوەند بۆ دەرەبەگ. (ب) کردارێك یا دیارییەکە کە پەیوەندی نێوان وەرزێرو دەرەبەگ و ئاغای دەردەخات.
(٢) ( do ~ ; pay ~ ) ڕێزلێگرتنێکی زۆر؛ کڕنووش؛ کردەوەیەك یا شتێکی دراو کە ئەم ڕێزلێنانە پیشان دەدات:
*( The town paid ~ to the great man.)*

**hombre** (ôm′brā, om′bri), *n.* [Slang], پیاو؛ کابرا؛ زەلام؛ کەس.

**home** (hōm), *n.* (١) ماڵ؛ ماڵەوە؛ خانە؛ لانە.
(٢) نیشتەجێ؛ هەوارگا؛ مەڵبەند.
(٣) جێی لەدایکبوون؛ نیشتمان؛ شاری خۆ.
(٤) شوێنی ئاسوودەیی و خۆشی.
(٥) گۆڕ؛ ئارامگا.
(٦) خێزان؛ ماڵ: *( There are only ten ~s in the village.)*
(٧) کەڵفتەکارخانە؛ هەتیوخانە؛ تەمەڵخانە؛ هەژارخانە.
(٨) دەوروبەری سروشتی گیاندار یا ڕووەك.
(٩) مەڵبەند: *( Paris is the ~ of women's fashion.)* .
(١٠) گۆڵ (وەرزش). (١١) سەرشار.
*adj.* (١) ماڵی؛ خۆماڵی. (٢) ناوخۆ؛ ناوخۆیی (وەزارەت).
(٣) بارەگای گشتی؛ بارەگا: *( a ~ office )* .
(٤) بەکار؛ سەرکەوتوو.
(٥) لە شاری تیپەکە خۆی دەکرێت (وەرزش، ملەملێ): *( a ~ game)* .
*adv.* (١) بۆ ماڵەوە؛ بەرەو ماڵەوە؛ لە ماڵەوە.
(٢) بەرەو شوێنی خۆی؛ بەرەو ئەنجام: *( He drove the nail ~ .)*
(٣) بۆ ناوجەرگەی مەسەلەکە؛ یەکسەرو بەباشی (دووان، پیشاندان):
*( He drove the point ~ .)*
*v.i.* (١) چوونەوە بۆ ماڵەوە. (٢) ماڵ هەبوون؛ خاوەن خێزان یا ماڵ بوون
*v.t.* لانە پێدان؛ گرتنەخۆ؛ پەنادان؛ بردنە ماڵەوە.
**at home,** (١) لە ماڵەوە؛ لە ماڵی خۆدا؛ لە گەڕەك، شار یا نیشتمانی خۆدا.
(٢) وەك لە ماڵی خۆدا بوون؛ بە ئاسوودەو شادمان؛ پێ خۆش بوون (شوێن)
*( I feel at home in this town.)*
(٣) شارەزا؛ بزان: *( He is at home in this subject.)* .
(٤) پێشوازی میوان کردن.
(٥) ئاهەنگێك لە ماڵەوە.
**bring home to,** (١) پیشاندان؛ تێگەیاندن؛ پێ سەلماندن.
(٢) لۆمەکردن؛ خەتابارکردن
**come home,** (١) گەڕانەوە بۆ ماڵەوە؛ گەڕانەوە سەر شار؛ گەڕانەوە.
(٢) جێگیر نەبوون (لەنگەر)؛ نەگرتن.

**see a person home,** لەگەڵ کەسێکدا چوون بۆماڵەکەی خۆی؛
بردنەوەی کەسێك بۆ ماڵی خۆی.

**home-bred** (hōm′bred′), *adj.* (١) ماڵی؛ خۆماڵی
(٢) سادە؛ نەزان؛ هیچ نەزان؛ کێوی.

**home-brew** (hōm′brōō′), *n.* خواردنەوەی سەرخۆشکەری خۆماڵی
(بەتایبەتی بیرە).

**home-coming** (hōm′kum′iŋ), *n.* (١) هاتنەوە ماڵەوە؛ گەڕانەوە
بۆ ماڵەوە (پاش ماوەیەکی دووروودرێژ). (٢) ئاهەنگێکی ساڵانەی کۆلیج و
زانکۆ کە دەرچووانی ڕابوردوو تێیدا بەشدار دەبن.

**home economics,** هونەرو زانستی ماڵ بەڕێوەبردن؛ زانستی ماڵداری؛
کابانی

**home-grown** (hōm′grōn′), *adj.* خۆماڵی (میوەو سەوزە)؛
لە ناوچەی خۆ پەروەردەکراو.

**homeland** (hōm′land′), *n.* نیشتمان؛ وڵات

**homeless** (hōm′lis), *adj.* بێ لانە؛ بێ ماڵ؛ ئاوارە؛ وێڵ؛ دەربەدەر؛
بێ نیشتمان؛ سەرگەردان؛ بێکەس.

**homelike** (hōm′līk′), *adj.* خۆش و ڕەحەت وەك ماڵەوە؛
وەك ماڵی خۆ.

**homely** (hōm′li), *adj.* (١) (ا) خۆماڵی؛ خۆیی؛ ناوماڵی.
(ب) خانەپەرست؛ حەز لە ماڵەوە بوون کەر.
(٢) (ا) سادە؛ ئاسایی؛ خۆماڵی: *( ~ virtues)* .
(ب) سادە؛ نەزان؛ کێوی.
(٣) ناشرین (ئافرەت)؛ سادە؛ ڕووی دەرەوەی پێوە نییە: *( a ~ girl)* .

**-homeliness** *(n.).*

**home-made** (hōm′mād′), *adj.* (١) خۆماڵی؛ خۆکردە. (٢) سادە.

**home-maker** (hōm′māk′ẽr), *n.* کەیبانوو؛ ژن؛ ژنی ناوماڵ.

**homeo-** (hō′mi-ə, hom′i-ə), *Also* **home-**, **homoio-**,
پێشگرێکە بەمانای: هەمان؛ لەیەکچوو؛ وەك یەك؛ خۆ.

**Home Office,** وەزارەتی ناوخۆی ئینگلتەرە.

**home office,** بارەگای گشتی کۆمپانیایەك.

**homeopathy** (hō′mi-op′ə-thi), *n.* چارەکردنی هەندێ نەخۆشی
بە پێدانی دەرمانێکی کەم بە نەخۆشەکە، هەمان دەرمان کە ئەگەر زۆری
لێ بدرێت بە کەسێکی ساغ هەمان نەخۆشی دەگرێت.

**-homeopath** *(n.)*; **homeopathist** *(n.)*; **homeopathic** *(adj.)*;
**homeopathically** *(adv.).*

**Homeric** (hō-mer′ik), *adj.* هۆمەری: تایبەتی بە بوێژی یۆنانی
دێرین "هۆمەر" و هۆنراوەکانی و چەرخەکەی.

**home rule,** خودموختاری؛ حوکمی ناوخۆیی.

**homesick** (hōm′sik′), *adj.* بیری ماڵەوە کەر؛ بیری نیشتمان کەر؛
تووش بووی دەردی دووری.

**homesickness** (hōm′sik′nis), *n.* دەردی دووری (لە ماڵەوە یا
لە نیشتمان)؛ بیری ماڵەوە یا نیشتمان کردن؛ دەردی دوور وڵاتی؛
سۆزی نیشتمان.

**home-spun** (hōm′spun′), *n.* (١) قوماشی خۆماڵی.
(٢) قوماشی سادە یا ڕەشۆکی.
*adj.* (١) خۆماڵی (قوماش یا شتی تر). (٢) لە قوماشی خۆماڵی دروستکراو.
(٣) سادە؛ خۆماڵی: *( ~ virtues)* .

**homestead** (hōm′sted′), *n.* (١) خانووبەرە؛ ماڵ و زەوی وزاری
دەوروبەری. (٢) ماڵ؛ خانە.

**homestretch** (hōm′strech′), *n.* (١) دوا قۆناغی پێشبڕکێی
ئەسپ. (٢) دوا قۆناغی کارێك.

**hometown** (hōm′toun′), *n.* شاری لەدایکبوون؛ نیشتەجێ؛
شاری خۆ

**homeward** (hōm′wẽrd), *adv. & adj.* بەرەو ماڵەوە؛ بۆ ماڵەوە.

**homewards** (hōm′wẽrdz), *adv.* = **homeward.**

**homework** (hōm′wûrk′), *n.* (١) خوێندن و کۆششی ماڵەوەی
قوتابی؛ ئەرکی دراو بە قوتابی. (٢) خۆ ئامادەکاری؛ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەرك
یا کارێك: *( to do one's ~ )* .

**homey, homy** (hōm′i), *adj.* [Colloq.]. وەك ماڵی خۆ؛
خۆش و ڕەحەت و پڕ ئاسوودە وەك ماڵەوە.

**homicidal** (hom′ə-sīd′'l), *adj.* (١) تایبەتی بە پیاوکوژی.
(٢) پیاوکوژ؛ مەیلی پیاوکوژی هەیە: *( a ~ person)*

**homicide** (hom′ə-sīd′), *n.* (١) پیاوکوشتن؛ پیاوکوژی؛ کوشتن.
(٢) پیاوکوژ.

**homily** (hom′'l-i), *n.* (١) پەندی ئاینی (بەتایبەتی هی ئینجیل)؛
سەرگوزشتەی ئاینی؛ ئامۆژگاری (ئاینی).
(٢) ووتارێك دەربارەی ڕەووشت چاکی و ڕێی ڕاست و پاك گرتن.

**homing** (hōm′iŋ), *adj.* (١) بەرەو ماڵەوە؛ بۆ ماڵەوە؛ ڕۆیشتوو بۆ
ماڵەوە. (٢) بیری ماڵەوە کەر؛ حەزکەر لە چوونە ماڵەوە.

**homing pigeon,** کۆتری نامەبەر؛ کۆتری ماڵ دۆزەرەوە: جۆرە کۆترێکە
پاش ڕاهێنان دەتوانێت لە دوورەوە بگەڕێتەوە سەر ماڵەکەی خۆی بێ ئەوەی
ڕێ وون بکات.

**hominy** (hom′ə-ni), *n.* گەنمەشامی هاڕراو یا کوتراو.

**homo** (hō′mō), *n.* (١) مرۆڤ؛ ئادەمیزاد؛ پیاو.
(٢) توخمی مرۆڤی ئێستا و چەند توخمێکی کۆنی نەماو.

**homo-** (hō′mə, hom′ə), پێشگرێکە بەمانای: هەمان؛ چوونیەك؛
وەك یەك؛ لەیەکچوو.

**homochromatic** (hō′mə-krō-mat′ik), *adj.* یەك ڕەنگ

**homogamous** (hō-mog′ə-məs), *adj.* (١) گوڵی یەك توخم؛
گوڵی نێرك و نێرەکدار. (٢) نێرك و نێرەك، واتە ئەندامی مێینەونێرینەی گوڵ،
پێکەوە پێگەییو.

**homogeneity** (hō′mə-jə-nē′ə-ti), *n.* چوونیەکی؛ هاوتوخمی؛
یەك شێوەیی؛ یەکدانی؛ لەیەکچوون؛ یەکسانی.

**homogeneous** (hō′mə-jē′ni-əs), *adj.* هاوتوخم؛ یەکسان؛
چوونیەك؛ یەك شێوە؛ یەکدان.

**homogenize** (hō′mə-jə-nīz′), *v.t.* یەکسان کردن؛
وەك یەك لێکردن؛ یەك شێوە کردن؛ یەك توخم کردن؛ هاوتوخم کردن

**homogenized milk,** شیرێکە کە چەورییەکەی وەها ووردکراوە
کە دانرا سەرتوێژ ناگرێت.

**homogenous** (hō-moj′ə-nəs), *adj.* هاوڕەگەز (ژیوارناسی،
زیندەوەرزانی)؛ هاوتوخم؛ چوونیەك.

**homogeny** (hō-moj′ə-ni), *n.* هاوڕەگەزی؛ هاوتوخمی؛ چوونیەکی.

**homograph** (hom′ə-graf′, hō′mə-gräf′), *n.* هاوحونجە:
ووشەیەکە کە وەك ووشەیەکی تر حونجە دەکرێت، بەڵام ماناو سەرچاوەکەی
جیاوازەو هەندێك جار بێژانەکەیشی: (قوڕقوشم **lead** ؛ ڕابەری کردن: **lead** )

**homologous** (hō-mol′ə-gəs), *adj.* چوونیەك (لە پێکهاتن و
فرمان و جێگەو باردا)؛ هاوسەرچاوە (ژیوارناسی)؛ هاوڕەگەز.

**homomorphic** (hō′mə-môr′fik, hom′ə-môr′fik), *adj.* =
**homomorphous.**

**homomorphism** (hō′mə-môr′fiz'm), *n.* هاوشێوەیی؛
هاوشێوەیی و هاوقەبارەیی.

**homomorphous** (hō′mə-môr′fəs), *adj.* هاوشێوە؛
هاوشێوەو هاوقەبارە.

**homomorphy** (hō′mə-môr′fi, hom′ə-môr′fi), *adj.* =
**homomorphism.**

**homonym** (hom′ə-nim′, hō′mə-nim′), *n.* (١) ووشەی-
هاودەنگ و هاوحونجە: ووشەیەکە کە دەنگ و حونجەی وەك ووشەیەکی تر بێت.
بەڵام ماناو سەرچاوەی جیا بێت: (گۆمی مەلە؛ گۆمی ئاو: **pool** ،
یاری بلیارد **pool** )، (قۆچ هاوێژ: **butter** : کەرە: **butter** ).
(٢) ووشەی هاوبێژ: ووشەیەکە کە دەنگی وەك ووشەیەکی تر وایە. بەڵام ماناو

سەرچاوەو حونجەی جیایە: (سەتڵ: **pail** : ڕەنگ زەردهەڵگەڕاو: **pale** ).
ووشەی **homograph** ؛ **homophone** ببینە).
(٣) کەسی هاوناو؛ مرۆڤی هەمان ناو.

**homonymous** (hō-mon′ə-məs), ***adj.*** (١) هاوبێژو هاوحونجە
ووشەی پێشوو ببینە). (٢) هاوبێژ (ووشە).
(٣) هاوناو (مرۆڤ).

**homonymy** (hō-mon′ə-mi), ***n.*** (١) هاوبێژیو هاوحونجەیی.
(٢) هاوبێژی. (٣) هاوناوی.

**homophone** (hom′ə-fōn′), ***n.*** (١) تیپی هاودەنگ.
وەك **c, s:** **saucer** ؛ **g, j:** **gem, jump** ).
(٢) ووشەی هاوبێژ: ووشەیەکە کە هەمان دەنگی هەبێ وەك ووشەیەکی تر.
بەڵام حونجەو ماناو سەرچاوەی جیا بێت: (وەك: مام ناوەندی؛ پەین؛ قژ زەرد **fair** ، کرێ: **fare** ). (قەڕەم: **reed** ؛ خوێندنەوە: **read** ).
ووشەی **homonym** ؛ **homograph** ببینە).

**homophonic** (hom′ə-fon′ik), ***adj.*** (١) هاوبێژ (ووشە).
(٢) هاوبێژ (تیپ).

**homophonous** (hō-mof′ə-nəs), ***adj.*** = **homophonic.**

**homophony** (hō-môf′ə-ni), ***n.*** هاوبێژی (ووشە، تیپ).

**Homosapiens** (hō′mō sā′pi-enz′), مرۆڤ؛ ئادەمیزاد.

**homosexual** (hō′mə-sek′shoo-əl), ***adj.*** حیز؛ هەتیوباز؛
حەز لە هاوتوخم کەر.
***n.*** کەسێکی حیز یا هەتیوباز.

**homosexuality** (hō′mə-sek′shoo-al′ə-ti), ***n.*** حیزی؛
حیزێتی؛ هەتیوبازی؛ حەز لە هاوتوخم کردن.

**homy** (hōm′i), ***adj.*** [Colloq.], = **homey.**

**hone** (hōn), ***n.*** هەستان؛ زبرە.
***v.t.*** تیژکردنەوە (بە هەستان یا زبرە)؛ دەمەزەردکردن (ڕاستی یا مەجازی).

**hone** (hōn), ***v.i.*** [Dial.], (١) بۆ بەتاسەوە بوون؛ زۆر ویستن.
(٢) بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵاکردن.

**honest** (on′ist), ***adj.*** (١) بەڕێز؛ ڕێز لێ گیراو؛ بڕواپێکراو؛ باش.
(٢) پاك (مرۆڤ)؛ ڕاستگۆ؛ ڕاستاڵ؛ ڕاست؛ سەرڕاست؛ دڵپاك؛ دڵوداوێن پاك:
*( an ~ man)*
(٣) دڵسۆزانە؛ بەدڵ؛ بە ڕاستی: *( an ~ effort)* .
(٤) بە شەرەف؛ سەربەرز؛ پاك؛ بە پاکیو ڕێی ڕاست گرتن دەسکەوتووە:
*( an ~ living)*
(٥) ڕاستەقینە؛ پوختە؛ بێ فێڵو گزی: *( ~ wool)* .
(٦) سادەو کراوە؛ هیچ نەشارەوە: *( an ~ face)* .
(٧) [Archaic]، داوێن پاك.

**honestly** (on′ist-li), ***adv.*** (١) بە پاکی؛ بە دڵپاکی؛ بە سەرڕاستی؛
بە دڵسۆزانە. (٢) بەڕاستی؛ بڕوا بکە؛ درۆت لەگەڵ ناکەم؛ بەڕاستمە:
*( H~ , I'll do it.)*

**honesty** (on′is-ti), ***n.*** (١) دڵپاکی؛ پاکی؛ ڕاستگۆیی؛ سەرڕاستی؛
ڕاستی؛ ڕاستو درووستی. (٢) [Archaic]، داوێن پاکی.
(٣) جۆرە ڕووەکێکی گوڵ ئەرخەوانییە.

**honey** (hun′i), ***n.*** (١) هەنگوین. (٢) شتی شیرین.
(٣) گیانەکەم؛ خۆشەویستەکەم؛ شیرینەکەم؛ چاوەکەم.
***adj.*** (١) هەنگوینی. (٢) شیرین؛ خۆشەویست.
***v.t.*** (١) شیرین کردن؛ خۆش کردن.
(٢) بە زمانی خۆش لەگەڵ دووان. (٣) مەرایی کردن؛ کلکەلەقێ بۆ کردن.
***v.i.*** بە زمانی خۆشو شیرین لەگەڵ دووان.

**honeybee** (hun′i-bē′), ***n.*** هەنگ.

**honeycomb** (hun′i-kōm′), ***n.*** (١) شانە هەنگوین؛
دووبەرەی هەنگوین. (٢) شتێك کە لە شانە هەنگوین بکات.
***v.t.*** (١) کون کون کردن؛ کون تێکردن. (٢) بنکەن کردن؛ هەمووگرتنەوە.
***v.i.*** کون کون بوون؛ کون تێ بوون.
***adj.*** شانە هەنگوینی؛ وەك شانە هەنگوین.

**honeydew** (hun′i-doo′, hun′i-dū′), ***n.*** (١) شیلە (کە گەڵای
هەندێك درەخت دەریدەدات). (٢) **honeydew melon**

**honeydew melon,** جۆرە کاڵەکێکی زۆر شیرینە وەك هەنگوین.

**honeyed** (hun′id), *alternative past tense and p.p. of-* **honey.**
***adj.*** (١) شیرین کراو؛ شیرین؛ هەنگوین تێکراو.
(٢) خۆشو شیرین (ووشە، دووان): *( ~ words)* .

**honeymoon** (hun′i-moon′), ***n.*** (١) یەکەم مانگی دوای ژنهێنان یا
شووکردن. (٢) مانگی شەکراو؛ ئەو کاتەی بووكو زاوا پێکەوە بەسەری دەبەن
دوای شایی.
***v.i.*** شیرینە مانگ ڕابواردن؛ ماوەی دوای شایی پێکەوە بردنە سەر (بووكو زاوا).

**honeysuckle** (hun′i-suk′l), ***n.*** ڕووەکێکی گەڵاوگوڵ شیلاوی
گوڵ سپیو بۆن خۆشە بە دارو دیواردا هەڵدەگەڕێت.

**honied** (hun′id), ***adj.*** = **honeyed.**

**honk** (hôŋk, hoŋk), ***n.*** (١) دەنگی قازە کێویلە. (٢) هۆڕنی ئوتومبیل.
***v.i. & v.t.*** هۆڕن لێدان.

**honky-tonk** (hôŋ′ki-tôŋk′), ***n.*** [Slang], مەیخانە یا تیاترۆیەکی
هەرزانبەهاو بەدناو.

**honor, honour** (on′ẽr), ***n.*** (١) ڕێز.
(٢) ناوبانگ؛ ناوی باش؛ سەربەرزی.
(٣) ڕاستی؛ ڕەووشت چاکی؛ باشی؛ سەربەرزی:
*( He conducts himself with ~ . )*
(٤) داوێن پاکی؛ پاکی.
(٥) نامووس؛ شەرەف؛ ئابڕوو؛ حەیا.
(٦) شانازی؛ جێی شانازی: *( It is a great ~ to be your friend.)*
(٧) [H-]، نازناوی ڕێزگرتن (بەڕێزتان، بەڕێز فلان کەس)؛ جەناب:
*( Your, His, Her H~ )*
(٨) خەڵات؛ نیشانەی خەڵات.
(٩) (*pl.*) خەڵات یا بڕوانامەی شەرەف کە دەدرێت بە قوتابی لێهاتووو زیرەك.
(١٠) بەڵێنی شەرەف (بۆ کردن یا نەکردنی کارێك).
(١١) مایەی سەربەرزیو شانازی: *( to be an ~ to one's family)* .
***v.t.*** (١) ڕێزلێنان؛ ڕێزگرتن.
(٢) گەورەکردن (ئەڵێن: گەورەت کردین)؛ ڕێزگرتن: *( to ~ someone)* .
(٣) پەرستن. (٤) خەڵات کردن.
(٥) (ا) ڕاگرتن؛ نەشکان؛ پەیڕەوی کردن: *( to ~ an agreement)*
(ب) قایل بوون بە دانەوەی قەرز لەکاتی خۆیدا:
*( Will you ~ this check?)*

**do honor to,** (١) زۆر ڕێزلێگرتن.
(٢) بوون بە مایەی شانازی بۆ؛ گەورەکردن.

**do the honors,** (١) خانەخوێیی کردن؛ بە ئەرکی خانەخوێ هەڵسان.
(٢) ئەرکی ئاهەنگگێڕ بینین وەك میوان بەیەکتری ناسینو ووتاری پێشەکی
خوێندنەوەو بادەنۆشین خوازی.

**on ( or upon ) one's honor,** شەرەف خواردن؛ سوێند بە شەرەف
خواردن. (ئەڵێن: بە شەرەفم): *( on my honor )* .

**honorable** (on′ẽr-ə-b'l), ***adj.*** (١) بەڕێز (کە وەك نازناو
بەکاردەهێنرێت: بەڕێز فلان کەس)؛ جەناب. (٢) بەناوبانگ؛ بەڕێز.
(٣) بە شەرەف؛ بە نامووس؛ سەربەرز؛ ڕووسپی؛ مەرد: *( an ~ man)* .
(٤) (ا) جێی شانازیە: *( ~ mention)* .
(ب) مایەی شەرەفو سەربەرزییە: *( ~ peace terms)*

**honorably** (on′ẽr-ə-bli), ***adv.*** بە شەرەفەوە؛ بە نامووسەوە؛
مەردانە؛ بە سەربەرزی: *( to behave ~ ; to live and die ~ )* .

**honorarium** (on′ə-râr′i-əm), ***n.*** خەڵاتی ڕێزگرتن: ئەو پارەیەیە
کە دەدرێت بە کەسێك لە بریتی کارێك کە کرێی بۆ نەبڕاوەتەوە.

**honorary** (on′ə-rer′i), *adj.* (١) تەنها لەرووی ڕێزگرتنەوە دەکرێت یا دەدرێت: بڕوانامەی دکتۆرا؛ شانازنامە: *( an ~ degree)*
(٢) (ا) هەر بەناو و لەرووی ڕێزلێنانەوە (پلەیەکی بەرز لە دەزگایەکدا): *( the ~ president of the club; an ~ title)*
(ب) بە خۆشی خۆی بێ مووچە (ئەرک بینین).
(٣) لەسەر بەڵێن و سەرڕاستی ئەو کەسە بەندە نەک لەسەر یاسا (ئەرکی سەرشان، قەرز)

**honorific** (on′ə-rif′ik), *adj.* بۆ ڕێزلێگرتنە؛ بۆ شانازی دەربڕینە (بەو کەسەوە *( an ~ title)*
*n.* ووشە، نازناو، یا شێوەیەکی بانگ کردن و گفتوگۆیە کە نیشانەی ڕێزگرتنە لەو کەسە

**honour** (on′ēr), *n. & v.t.* = **honor.**

**hood** (hood), *n.* (١) کڵاو یا کلێتەی سەروملی داپۆش (بە جیا یا وەک بەشێک لە ڕۆب و عەبا وەک هی قەلەندەری خاچ پەرستان). (٢) (ا) کڵاوی ڕۆبی ئاهەنگی دەرچوونی قوتابی کۆلێج و زانکۆ. (ب) بۆنێت یا کڵاوەی ئوتومبێل. (ج) سەری عەرەبانەی ئەسپ و منداڵ. (ه) چاوبەستی باز (کاتی ڕاونەکردن).
(٣) پۆپنەی باڵندە: کڵاوەی مەل
*v.t.* (١) کڵاو کردنەسەر؛ کڵاوە کردنەسەر؛ چاوبەستکردن
(٢) شاردنەوە؛ داپۆشین.

**hood** (hood), *n.* [Slang], شەلاتی؛ شەقاوە؛ شەقاوەچی.

**-hood** (hood), پاشگرێکە بەمانای: (١) بار؛ سەردەم؛ چەرخ: *( childhood)*
(٢) هەموو ئەندامانی کۆمەڵە یا پیشەیەک *( priesthood)*.

**hooded** (hood′id), *adj.* (١) کڵاو لەسەر؛ کڵاودار
(٢) کڵاوەدار؛ سەردار؛ داپۆشراو (٣) پۆپنەدار.

**hoodlum** (hōōd′ləm), *n.* [Colloq.], شەلاتی؛ شەقاوە؛ شەقاوەچی.

**hoodwink** (hood′wiŋk′), *v.t.* (١) چاوبەستکردن؛ چاوبەستنەوە
(٢) [Obs.] شاردنەوە؛ داپۆشین
(٣) خەڵەتاندن؛ هەڵخەڵەتاندن؛ ساختەلێکردن؛ بەفریوبردن.

**hooey** (hōō′i), *interj. & n.* [Slang], قسەی قۆڕ و بێ مانا؛ قسەی هیچ و پووچ

**hoof** (hoof, hōōf), *n.* (١) سمی ووڵاخ؛ سمی گیاندار
(٢) [Slang] پێ؛ قاچ.
*v.t. & v.i.* (١) بە ژێر پێوەکردن؛ پێشێل کردن؛ کوتانەوە بە سم.
(٢) [Colloq.] بە پێ ڕۆیشتن؛ پیاسەکردن. (٣) [Slang]، سەماکردن.
(٤) [Slang] ئیمزاکردن؛ مۆرکردن

**on the hoof,** زیندوو؛ سەرنەبڕاو

**hoofed** (hooft, hōōft), *adj.* سمدار

**hoofer** (hoof′ēr, hōōf′ēr), *n.* [Slang], سەماکەر

**hook** (hook), *n.* (١) قولاپ (٢) قولاپی ڕاوەماسی
(٣) (ا) سنگ، جل هەڵواسین. (ب) قەنارە
(٤) [Nautical Slang]، لەنگەر (کەشتی). (٥) داس.
(٦) (ا) نووکی چەماوەی زەوی (ب) پێچی ڕووبار یا جۆگە.
(٧) داو؛ تەڵە (٨) بەشی داکوتراوی ئەنجامە.
*v.t.* (١) بە قولاپ گرتن (٢) خەڵەتاندن؛ هەڵخەڵەتاندن؛ دەسبڕین؛ فریودان؛ ساختەلێکردن (٣) دزین؛ ڕفاندن (٤) قۆچ لێدان؛ بریندارکردن.
(٥) وەک قولاپ لێکردن. (٦) سووڕان؛ سووڕنی چەماوە؛ شیشی چنین.
(٧) تۆپ لێدان و پێچ پێکردنەوەی (یاری بێسبۆل)
(٨) پێوەکردن (ژنهێنان و شووکردن)؛ پێوەبوون.
*v.i.* (١) چەمینەوە؛ چەمانەوە
(٢) (ا) بەسترانەوە بە قولاپ (ب) گیرانەوە بە قولاپ
(٣) [Slang] پێوەبوون (ژنهێنان و شووکردن). *( He is ~ed.)*
(٤) [Slang] تووش بوون و واز بۆ لێ نەهێنران (خوو، خۆشەویستی)؛ پێوەبوون؛ تێکەوتن (دڵداری): *( He is ~ed on cigarettes.; She is ~ed on him.)*

**by hook or by crook,** بەزۆر بێ یا بە خوایشت؛ بە هەرچۆنێک بێت؛ بە هەرشێوەیەک بێت.

**get off the hook,** ڕزگارکردن لە ئەرکێک یا لێپرسینەوەیەک؛ بەرەڵاکردن؛ شتێکی ناخۆش لەکۆڵ کردنەوە.

**hook up,** (١) پێوەبەستن بە قولاپ. (٢) بەستن بە ئەلەکتریکەوە (ڕادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ پێکەوەبەستن؛ کردن بەیەکدا.

**hookah, hooka** (hook′ə), *n.* نێرگەلە.

**hook and eye,** قولاپ و ئەڵقەیەکی بچووکە دەکرێن بەیەکدا بۆ جل بەستن بەیەکەوە (سوخمەی مەمک، بەروانکە... هتد).

**hooked** (hookt, hook′id), *adj.* (١) چەماوە.
(٢) قولاپدار؛ سنگدار. (٣) [Slang]، (ا) هۆگری بەنگە؛ تلیاک خۆر.
(ب) پێوەبوو؛ بە دواوەوە بوو؛ گیراو.

**hooker** (hook′ēr), *n.* (١) کەشتییەکی بچووکی دوو تەوەرەی هۆڵەندییە. (٢) کەشتییەکی یەک تەوەرەی ئینگلیزی یا ئێرلەندییە
(٣) کەشتییەکی کۆنی ناقۆڵا. (٤) [Slang]، سیخوڕ؛ جاسووس.

**hooker** (hook′ēr), *n.* [Slang], (١) قومێک ویسکی
(٢) قەحبە؛ ئافرەتێکی سووک.

**hook-nose** (hook′nōz′), *n.* لووتی چەماوە.
-**hooknosed** *(adj.)*.

**hook-up** (hook′up′), *n.* (١) تەل و سویچی بەستنی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن... هتد؛ بەستنی ئەم شتانە.
(٢) [Colloq.]، پەیمان یا یەکگرتنی دوو حیزب یا فەرمانڕەوایی.

**hook-worm** (hook′wūrm′), *n.* کرمی قولاپدار (لەریخۆڵەدا)

**hooky** (hook′i), *n.* [Colloq.], خۆدزینەوە لە قوتابخانە یا لە ئیش: *( to play ~ )*

**hooligan** (hōō′li-gən), *n.* =**hoodlum.**
-**hooliganism** *(n.)*.

**hoop** (hōōp, hoop), *n.* (١) ئەڵقە، شریت، یا تیرەیەکی ئاسنە کە دەوری بەرمیلی تەختەوسندووقی پێ دەگیرێ. (٢) ئەڵقەی دەست؛ ئەموستیلە
(٣) ئەڵقەی ژێر تەنوورە (بۆ فشکردنەوەی).
*v.t.* دەورەدان بە ئەڵقە، شریت، یا تیرەیەک

**hoopla** (hōōp′lä), *n.* [Colloq.], (١) هەراوزەنا؛ هەراوهوریای ئاهەنگ و خۆشی؛ دەبدەبە. (٢) دووانێکە بۆ چاوبەستکردن و بەهەڵەدابردن و سەر لێ شێواندن.

**hoopoe** (hōō′pōō), *n.* پەپووسلێمانکە.

**hoop skirt,** (١) چوارچێوەی ژێر تەنوورە بۆ فشکردنەوەی
(٢) تەنوورەی فشکراوە بەم شێوەیە.

**hooray** (hoo-rā′), *interj., n., v.i. & v.t.* = **hurrah.**

**hoot** (hoot), *v.i.* (١) خوێندنی کوندەپەپو. (٢) هووهاکێشان.
*v.t.* (١) هووها لێ کێشان؛ ناڕەزایی دەربڕین بە هووها لێ کێشان.
(٢) بە هووهاکێشان کردنەدەرەوە: *( They ~ted him out of the room.)*
*n.* (١) دەنگی کوندەپەپو؛ خوێندنی کوندەپەپو. (٢) دەنگێکی وەها.
(٣) هووها؛ هووهاکێشان
(٤) شتێکی هیچ و پووچ و بێ نرخ: *( He doesn't give a ~ for your opinion.)*

**hooves** (hōōvz, hoovz), *n. alternative plural of* **hoof.**

**hop** (hop), *v.i.* (١) بە هەنگلەشەلێ بازدان یا ڕۆیشتن.
(٢) قونەکردن (بۆق، مەل)؛ قونەقون کردن؛ هەڵقونین؛ بازدان.
(٣) [Colloq.]، سەماکردن.
(٤) [Slang]، ڕۆیشتن.
*v.t.* (١) بەسەردا بازدان؛ خۆ بەسەردا هەڵدان: *( H~ the hedge.)*
(٢) خۆ هەڵدانە سەر؛ بازدانە سەر؛ سواربوون: *( to ~ a train)*
(٣) [Colloq.]، بەسەردا فڕین بە فڕۆکە.
*n.* (١) هەنگلەشەلێ. (٢) قونە؛ قونەقون؛ بازدان؛ خۆهەڵدان.

(٣) [Colloq.]. سەما. (٤) [Colloq.]، بە فڕۆکە فڕین بەسەردا.

**hope** (hōp), *n.* (١) هیوا؛ ئومێد؛ ئومێدەواری؛ ئاوات؛ خواست.
(٢) ئامانج.
(٣) کەسێک یا شتێک کە هیوای شتێکی لێ دەکرێت: *( He is our ~ . )*.
(٤) [Archaic]: پشت پێ بەستن.

*v.t. & v.i.* هیواداربوون؛ هیوابوون؛ هیواکردن؛ ئومێدکردن؛ ئاوات خواستن؛ ویستن؛ داواکردن؛ بەتەمابوون.

**hope against hope,** هیواکردن هەرچەند هیواش بڕاوە؛ هیوا نەبڕین ئەگەرچی لەوە دەچێ شتەکە هیچ هیوایەکی لێ ناکرێ.

**hopeful** (hōp′fəl), *adj.* (١) هیوادار؛ ئومێدەوار؛ ئاواتەخواز؛ بەتەما.
(٢) جێی هیوایە؛ باش؛ هیوابەخش: *( a ~ sign)*.

*n.* کەسێک کە هیوای سەرکەوتنی لێ دەکرێ؛ کەسێک کە کۆششی سەرکەوتن دەکات: *( a presidential ~ )*.

**hopefully** (hōp′fəl-i), *adv.* (١) بە ئومێدەواری؛ بە هیوادارانە.
(٢) ئومێد وایە؛ وا هیوا دەکرێت: *( H~ we will arrive this evening.)*.

**hopeless** (hōp′lis), *adj.* (١) بێ ئومێد؛ نائومێد؛ هیوابڕاو؛ بێ هیوا: *( a ~ person)*
(٢) ئومێدی لێ ناکرێ؛ تاریک؛ لێڵ.
(٣) بێ دەرمان؛ دەرمانی نییە.
(٤) بێ چارە؛ چارەسەری نییە: *( a ~ situation)*
(٥) قەڵب؛ ناڵەبار؛ بێ فەڕ؛ ناکارامە: *( a ~ teacher, tennis player, writer, etc.)*

-hopelessly *(adv.)*; hopelessness *(n.)*.

**hophead** (hop′hed′), *n.* [Slang], بەنگکێش؛ تلیاک خۆر

**hopper** (hop′ẽr), *n.* (١) قونەکەر (مرۆڤ، گیاندار)؛ بازدەر.
(٢) جانەوەری قونەکەر (کوللە).
(٣) (ا) ڕەحەتی (شت پێ تێکردن)؛ گوڵبینە (کەنوو).
(ب) عەمار؛ کەنوو؛ دەفری شت تیاهەڵگرتنی سەردەمی.

**hopple** (hop′'l), *v.t. & n.* = **hobbel.**

**hopscotch** (hop′skoch′), *n.* یاری خەتخەتێن.

**horde** (hôrd, hōrd), *n.* (١) خێڵێکی کۆچەری مەغۆلی.
(٢) خێڵێکی کۆچەر؛ کۆمەڵێکی گەڕۆک.
(٣) ئۆردو؛ گەلە؛ پوورە؛ کۆمەڵێکی وورووژاو؛ کۆمەڵ.

*v.i.* بە جەماوەر پێکەوە ژیان؛ بە کۆمەڵ یا ئۆردو پێکەوە ژیان.

**horizon** (hə-rī′z'n), *n.* (١) ئاسۆ؛ کەناری ئاسمان
(٢) مەودای توانا و دووربینی و شارەزایی و ڕێ بەدییی: *( a man of limited ~s)*

**horizontal** (hôr′ə-zon′t'l, hor′ə-zon′t'l), *adj.* (١) تایبەتی بە ئاسۆ؛ ئاسۆیی (٢) ئاسۆیی (هێڵ)؛ لابەلا: *( a ~ line)*.
(٣) هی هەمار چین یا پلە. (٤) تەخت.

-horizontally *(adv.)*.

**horizontal union,** یەکێتی کرێکارانی یەک پیشە؛ نەقابەی یەک پیشەگەری

**hormone** (hôr′mōn), *n.* هۆرمۆن: ماددەیەکە هەندێ گلاند یا لووی لەش دەریدەدات کە گەیشتە هەندێ ئەندامی لەش کاری تێدەکات.

-hormonal *(adj.)*; hormonic *(adj.)*.

**horn** (hôrn), *n.* (١) شاخ (بزن، بەران، گا، بەرانەکێوی... هتد).
(٢) شاخی هەندێ جانەوەر (کوللە، شەیتانۆکە... هتد).
(٣) (*pl.*) نیشانەی پیاوی ژن گایراو. (٤) خواردنەوەیەک کەلە کەڵەشاخدا بێ.
(٥) کەڵەشاخی بیت و زەبەنەیی. (٦) کەڵەشاخ.
(٧) شتێک کە لە کەڵەشاخ بچێت: (ا) ئەمسەرو ئەوسەری مانگی تازە.
(ب) نووکی زەوی سێ لا ئاوی. (ج) لووتی دەزگا. (د) قەڵپووزی زین.
(ه) زێی ڕووبار. (٨) (ا) بوقیە (مۆسیقا). (ب) کەڵەشاخێک کە فووی پیادەکرێ.
(٩) (ا) هۆڕنی ئوتومبیل. (ب) هۆڕنی تەم: *(fog ~ )*
(١٠) لووتکەی سەختی چیایەک.
(١١) نیشانەی سەربەرزی و پایەبەرزی و بەهێزی.

*v.t.* (١) شاخ لێ ڕوواندن. (٢) لە شێوەی شاخدا دروستکردن.
(٣) قۆچ لێدان؛ بەر قۆچ دان.
(٤) [Archaic]، سەرشۆڕکردنی پیاوێک بە گاینی ژنەکەی.

**blow one's horn,** [Colloq.], بە شان و باڵی خۆدا هاتن؛ ستایشی خۆ کردن؛ فشەفش کردن؛ لاف لێدان.

**horn in,** [Slang], خۆتێهەڵقورتان.

**hornbill** (hôrn′bil′), *n.* باڵندەیەکی ترۆپیکی گەورەی دەنووک نوشتاوەیە.

**horned** (hôrnd), *adj.* (١) شاخدار: *( a ~ cow)*.
(٢) سەری وەک شاخە: *( the ~ moon)*.
(٣) [Archaic]، ژن گایراو

**horned toad,** جۆرە مارمێلکەیەکی پێست پوولەکەداری کلک کورتی لەش دڕکاوی وەک شاخ.

**hornet** (hôr′nit), *n.* زەردەواڵە؛ شەنگەسوورە.

**hornets' nest,** شارە زەردەواڵە؛ دەستەیەک لە دوژمنان و ناحەزان.

**horny** (hôr′ni), *adj.* (١) شاخدار. (٢) لە شاخ دروستکراو.
(٣) ڕەق وەک شاخ. (٤) [Slang]، بە خوروژش؛ بە ئانۆش؛ برسی گان.

-horniness *(n.)*.

**horologe** (hôr′ə-lōj′, hor′ə-loj′), *n.* کاتژمێر.

**horology** (hô-rol′ə-ji, hō-rol′ə-ji), *n.* (١) زانستی کات ژماردن؛ هونەری کاتژمێری. (٢) هونەری کاتژمێر دروستکردن.

-horologer *(n.)*; horologic *(adj.)*; horologist *(n.)*.

**horoscope** (hôr′ə-skōp′, hor′ə-skōp′), *n.* نەخشەی چارەنووس دۆزینەوە (بەگوێرەی شوێنی ئەستێرە لەکاتی لەدایکبوونی ئەو کەسەدا)؛ نەخشەی چەرخەکان و کەلووەکان (کە ئەستێرەناس و بەختگرەوە بەکاری دێنن).

**horrendous** (hô-ren′dəs, ho-ren′dəs), *adj.* ستەم؛ زۆر بەدو ناپەسەند (کردار)؛ پیس؛ زۆر خراپ؛ ناشرین (کردەوە).

**horrent** (hôr′ənt, hor′ənt), *adj.* (١) ڕەپ (وەک دڕک).
(٢) [Rare]، تۆقێنراو؛ تۆقاو؛ گیان هاتە لەرزین.

**horrible** (hôr′i-b'l, hor′i-b'l), *adj.* (١) ستەم؛ تۆقێنەر؛ ترسناک: *( War is ~ . )*
(٢) ناپەسەند؛ بەد؛ پیس؛ بۆگەن؛ خراپ؛ ناخۆش: *( a ~ smell, act, man, place, time, etc.)*

-horribly *(adv.)*.

**horrid** (hôr′id, hor′id), *adj.* (١) زبر؛ تیژ.
(٢) تۆقێنەر؛ ترسناک؛ ستەم.
(٣) [Colloq.]، بەد؛ ناپەسەند؛ ناخۆش؛ پیس؛ بۆگەن؛ خراپ؛ ناشرین.

**horrific** (hô-rif′ik, ho-rif′ik), *adj.* ستەم؛ ترسناک؛ تۆقێنەر.

**horrify** (hôr′ə-fī′, hor′ə-fī′), *v.t.* (١) تۆقاندن؛ زراوبردن؛ ترساندن. (٢) [Colloq.]، دڵ ڕاچڵەکاندن؛ داچڵەکاندن؛ دڵ داخورپاندن.

-horrification *(n.)*.

**horror** (hôr′ẽr, hor′ẽr), *n.* (١) لەرزین (لە ترسدا).
(٢) ترس؛ مەترسی؛ زراوچوون. (٣) ڕق؛ قین؛ قێزهاتنەوە؛ قین لێهاتن.
(٤) شتێکی ستەم؛ ترسناک، یا تۆقێنەر.
(٥) [Colloq.]، شتێکی زۆر ناخۆش و ناپەسەندو پیس.

**hors d'oeuvre** (ôr′dũrv′, ôr′duv′), *pl.* پێش خۆراک؛ مەزە؛ بەردڵکەرەوە.

**horse** (hôrs), *n.* (١) ئەسپ؛ ماین؛ بەرزە ووڵاخ. (٢) ئەسپ.
(٣) شتێک کە مرۆڤ سواری دەبێت وەک ئەسپ
(٤) چوارچێوەیەک کە مشارکاری لەسەر دەکرێت.
(٥) پیاو (لەڕووی گاڵتە، برادەری، یا سووکییەوە).
(٦) [Colloq.]، ئەسپی شەترەنج.
(٧) چوارچێوەی بەسەردا بازدان (تەنافبازی).

(۸) سوار، ئەسپ سواران (سوپا): *( a squadron of ~ )* .

*v.t.* (۱) سواری ئەسپ کردن؛ ئەسپ پێدان.

(۲) خستنەسەر ئەسپێکی دارینە بۆ فەلاقەکردن. (۳) فەلاقەکردن.

(٤) [Slang]. گاڵتەپێکردن؛ سەرخستنەسەر.

*v.i.* سواری ئەسپ بوون؛ بە سواری ئەسپ چوون.

*adj.* (۱) ئەسپی؛ ئەسپینە؛ تایبەتی بە ئەسپ.

(۲) بە سواری ئەسپەوە؛ بە سواری ئەسپ.

(۳) زل و گەورە و قەبە: *( ~ radish)* .

**back the wrong horse,** (۱) گرەوکردن لەسەر ئەسپی دۆڕاو (پێشبڕکێی ئەسپ). (۲) لایەنگیری کردنی لای دۆڕاو.

**be on one's high horse,** [Colloq.], خۆبادان؛ لەخۆبایی بوون؛ لووت بەرزی کردن.

**from the horse's mouth,** لە سەرچاوەکەوە (باس یا دەنگوباس بیستن: *( to get a story from the horse's mouth)* .

**hold one's horses,** [Slang], خۆراگرتن؛ دان بەخۆدا گرتن.

**horse around,** [Slang], زرمەزڵ کردن

**horse of another ( or different ) color,** مەسەلەیەکی زۆر جیاوازە

**horseback** (hôrs′bak′), *n.* (۱) پشتی ئەسپ. (۲) ئاوریژ.

*adv.* بە سواری: *( They came on ~ . )* .

**horsecar** (hôrs′kär′), *n.* (۱) ئوتومبیل یا واگۆنی ئەسپ ڕاکێش.

(۲) ئوتومبیلی ئەسپ گواستنەوە.

**horsefly** (hôrs′flī′), *n.* خەرەنگێز.

**horsehair** (hôrs′hâr′), *n.* (۱) تووکی یاڵ یا کلکی ئەسپ.

(۲) قوماشی ئەم تووکە.

*adj.* (۱) لەم تووکە دروستکراو. (۲) بەم تووکە داپۆشراو یا ئاخنراو.

**horsehide** (hôrs′hīd′), *n.* (۱) پێستە یا کەوڵی ئەسپ.

(۲) قایشی ئەم پێستەیە.

**horselaugh** (hôrs′laf′, hôrs′läf′), *n.* قاقای پێکەنین (لەرووی گاڵتەپێکردنەوە).

**horse mackerel,** جۆرە ماسییەکی گەورەیە (وەك " تونا ").

**horseman** (hôrs′mən), *n.* (۱) ئەسپ سوار؛ سوار.

(۲) سوارە (لەشکر). (۳) سوارچاك؛ ئەسپ ناسی.

**horsemanship** (hôrs′mən-ship′), *n.* سوارچاکی؛ ئەسپ سواری؛ شارەزایی؛ ئەسپ و ئەسپ سواری.

**horse opera,** [Slang], فیلم یا شانۆنامەیەکە لە بابەت گاوانی ئەمەریکاوە.

**horseplay** (hôrs′plā′), *n.* زرمەزڵ. شەرەشەق.

**horse-power** (hôrs′pou′ẽr), *n.* (۱) هێز یا خێرایی ئەسپێك.

(۲) پێوانەی تین یا توانای مەکینەیەك.

**horse-radish** (hôrs′rad′ish), *n.* تووری توون.

**horse sense,** [Colloq.], = **common sense.**

**horse-shoe** (hôr′shōō′, hôrs′shōō′), *n.* (۱) نالی ئەسپ؛ نال.

(۲) هەرشتێك لە نال بچێت. (۳) یارییەکە بریتییە لە فڕێدانی نال و خستنیە ناو سنگێکی داکوتراو لە دووری چل پێوە.

*v.t.* ئەسپ نال کردن

**horseshoe crab,** = **king crab.**

**horsetail** (hôrs′tāl′), *n.* (۱) کلکی ئەسپ.

(۲) درووشمی دەسەڵاتی پاشای تورکی کۆن.

**horsewhip** (hôrs′hwip′), *n.* قامچی؛ قەمچی.

*v.t.* قەمچی لێدان؛ بە قامچی لێدان.

**horsewoman** (hôrs′woom′ən), *n.* (۱) ئەسپ سواری ژن؛ سوار (ژن). (۲) سوارچاکی ژن؛ ئەسپ ناسی (ژن).

**horsy** (hôr′si), *adj.* (۱) ئەسپی؛ ئەسپین؛ لە ئەسپ دەچێ.

(۲) حەزکەر لە باسی ئەسپ و ڕمبازێن و ڕاو بە سواری ئەسپەوە... هتد.

-horsily *(adv.)*; horsiness *(n.)*.

**hortative** (hôr′tə-tiv), *adj.* = **hortatory.**

**hortatory** (hôr′tə-tôr′i, hôr′tə-tō′ri), *adj.* تایبەتی بە ئامۆژگاری و هاندان بۆ پیاوچاکی.

**horticulture** (hôr′ti-kul′chẽr), *n.* باخەوانی؛ باخەوانێتی؛ بێستانەوانی؛ زانستی درەختی بەردارو بێستان و گوڵ و گوڵزار پەروەردەکردن

-horticultural *(adj.)*.

**horticulturist** (hôr′ti-kul′chẽr-ist), *n.* باخەوان؛ بێستانەوان؛ زانای داری میوەو بێستان و گوڵ و گوڵزار.

**hosanna** (hō-zan′ə), *n. & interj.* هاوارێکە وەك: خوایە هەر خۆت گەورەیت! خوایە هەر خۆت هەیت! خوایە بە قوربانت بم!

**hose** (hōz), *n.* (۱) (ا) پانتۆڵی درێژ. (۲) پانتۆڵی کورت.

(۲) *(pl.)* (ا) گۆرەوی ژنانە. (ب) گۆرەوی پیاوانە. (۳) سۆندە؛ لاستیکی ئاو

*v.t.* (۱) بە سۆندە ئاودان؛ بە سۆندە ئاوپیاکردن و شۆردن.

(۲) [Slang]، بە سۆندە لێدان.

**hosier** (hō′zhẽr), *n.* گۆرەوی و جلی چنراو فرۆش.

**hosiery** (hō′zhẽr-i), *n.* (۱) (ا) گۆرەوی ژنانە و پیاوانە.

(ب) جلوبەرگی چنراو. (۲) پیشەی گۆرەوی و جلی چنراو فرۆشی.

**hospice** (hos′pis), *n.* خانەی ڕێبوارو فەقیرو هەژارو نەخۆشان (بەتایبەتی کە لایەکی ئاینی یا تەکیەیەك سەرپەرشتی بکات).

**hospitable** (hos′pi-tə-b'l), *adj.* (۱) میوانپەروەر؛ نان بدە؛ بەنان؛ خانزادە؛ بەخزمەت؛ میوانخواز.

(۲) مێشك کراوە؛ مێشك فراوان: *( to be ~ to new ideas)* .

-hospitably *(adv.)*.

**hospital** (hos′pi-t'l), *n.* (۱) (ا) لانەی ڕێبواران؛ خانەی ڕێبواری هەژار. (ب) هەتیوخانە؛ هەژارخانە.

(۲) خەستەخانە؛ نەخۆشخانە؛ بیمارستان؛ بیمارخانە؛ تیمارخانە.

**hospitality** (hos′pi-tal′ə-ti), *n.* میوانپەروەری؛ میوانداری؛ نان بدەیی؛ میوانخوازی؛ خزمەتی میوان کردن.

**hospitalization** (hos′pi-t'l-ə-zā′shən, hos′pi-t'l-ī-zā′-shən), *n.* لە خەستەخانە کەوتن؛ نوستن لە خەستەخانە.

**hospitalization insurance,** بیمەی چارەکردن لە خەستەخانەدا.

**hospitalize** (hos′pi-t'l-īz′), *v.t.* نواندن لە خەستەخانە بۆ دەرمان کردن؛ بردن بۆ خەستەخانە بۆ تیمارکردن.

**host** (hōst), *n.* (۱) خانەخوێ؛ میواندار؛ خاوەن ماڵ؛ ئاھەنگگێڕ.

(۲) خانچی؛ ئوتێلچی. (۳) گیانداریٍ یا ڕووەکێك کە دەبێتە لانەی گیاندار یا ڕووەکێکی تری مفتخۆرو لەسەری دەژێ.

*v.t. & v.i.* میوانداری کردن؛ خانەخوێیی کردن.

**host** (hōst), *n.* (۱) لەشکر؛ سوپا.

(۲) ئۆردو؛ ژمارەیەکی زۆرو بێ ئەندازە: *( a ~ of golden daffodils)*

**host** (hōst), *n.* نانی پیرۆزکراوی شێوی خواهانە (خاچ پەرستی).

**hostage** (hos′tij), *n.* دیل؛ بە دیل گیراو؛ دەستبەسەر.

**take someone hostage,** بە دیل گرتن (وەك بارمتە بۆ جێبەجێکردنی مەبەستێك).

**hostel** (hos′t'l), *n.* (۱) خان. (۲) ئوتێل یا خانەیەکی هەرزان بۆ ڕێبواری گەنج. (هەروەها پێشی دەوترێ: youth hostel ).

**hosteler** (hos′t'l-ẽr), *n.* (۱) خانچی؛ ئوتێلچی.

(۲) میوانی ئەم جۆرە ئوتێلە.

**hostess** (hōs′tis), *n.* (۱) خانەخوێ (ژن)؛ میواندار؛ خاوەن ماڵ.

(۲) (ا) ئوتێلچی (ژن)؛ خانچی. (ب) ژنی ئوتێلچی یا خانچی.

(۳) (ا) بەردەستی ناو فرۆکە (ژن). (ب) سفرەچی ژن؛ سەرەك بەردەستی چێشتخانە (کە پێشوازی لە خەڵك دەکات و لەسەر مێز دایان دەنێت).

**hostile** (hos′t'l), *adj.* (۱) دوژمنانە؛ جەنگاوەر: *( a ~ act)* .

(۲) ناحەز؛ دژ؛ ڕقاوی؛ ڕووناخۆش: *( a ~ person)* .

(۳) نەشیاو؛ نەگونجاو (دەوروبەر)؛ دژ: *( a ~ environment)*

**hostility** (hos-til'ə-ti), ***n.*** (١) دوژمنایەتی؛ دوژمنی؛ دووبەرەکی؛ رقەبەری؛ ناحەزی؛ قینەبەری. (٢) (ا) کاری ناحەزانە؛ کاری دوژمنانە. (ب) شەڕوشۆڕ؛ ئاژاوە؛ شەڕ. ***( to end all hostilities in the region)*** .

**hostler, ostler** (hos'lēr, os'lēr), ***n.*** (١) مەیتەر (٢) کرێکارێك کە مەکینەی شەمەندەفەر چی پێویست بێ دەیکات لە دوا ئێستگە بۆ باش ڕاگرتنی. (٣) [Obs.]، خانچی؛ ئوتێلچی.

**hot** (hot), ***adj.*** (١) گەرم؛ گەرموگوڕ؛ داغ؛ بەتین (ئاگر). (٢) توون؛ تیژ (بیبەر، پیاز) ***( ~ pepper)*** . (٣) تەنگەجیکلانە؛ زووهەڵچوو؛ سەرگەرم. ***( ~ temper)*** . (٤) (ا) توورە؛ توندوتیژ: ***( ~ words)*** . (ب) گەرم، جەنگ: ***( ~ battle)*** . (٥) بەجۆش. (٦) بە خرۆش؛ بە ئالۆش. (٧) مشتومڕی؛ مشتومڕی لەسەرە: ***( a ~ issue)*** . (٨) جنگ لەسەر شان (ڕافراندن): ***( ~ pursuit)*** . (٩) گەرم (تەل ئەلەکتریك)؛ ئەلەکتریکی لەسەرە. (١٠) [Slang]، (ا) نوێ (دەنگوباس)؛ تازە. ***( ~ news)*** . (ب) تازە گەیشتووە یا هاتووە: ***( ~ from the front)*** . (ج) تیژ (بۆن، بەتایبەتی لە ڕاوکردندا). (د) خەبەرلێدان یا پێگەیشتنێکی نهێنی تازەو گرنگ (دەربارەی ڕوونکردنەوەی ئاوابێت یا دۆزینەوەی شتێکی وون): ***( a ~ tip)*** . (هـ) تازە دزراو؛ شتی دزراو. (و) قاچاخ؛ شتی قاچاخ. (١١) [Slang]، نایاب؛ باش. (١٢) بەجۆش (مۆسیقای جاز).

***adv.*** بە گەرمی، بە گەرم؛ بە توونی؛ بە توندوتیژی.

**in hot water,** [Colloq.], لە تەنگو چەڵەمەدا بوون؛ لە ناخۆشی یا گێژاودا بوون.

**make it hot for,** ژیان لێ تاڵ کردن؛ ژیان لێ تێکدان؛ نارەحەت کردن.

**hot air,** [Slang], فشە، فشەفش؛ قسەی بۆش و هیچ‌وپووچ.

**hotbed** (hot'bed'), ***n.*** (١) شەتڵگایەکی بە شووشە دەورگیراوی پەین تێکراوی بە گەرمی ڕاگیراو بۆ شەتڵ بە خێرایی پەروەردەکردن. (٢) جێی زوو پەرەسەندنی شتێك: ***( This neighborhood is a ~ of crimes.)***

**hot-blooded** (hot'blud'id), ***adj.*** (١) خوێن گەرم؛ بەجۆش؛ بەهەست (٢) سەرگەرم؛ زووهەڵچوو.

**hot cake = pan cake.**

**sell ( or go ) like hot cakes,** [Colloq.], زۆری لێ دەفرۆشرێ و خێرا؛ زۆر بەبرەو دەبێ؛ کڕیاری زۆر دەبێ.

**hotchpot** (hoch'pot'), ***n.*** زەوی‌وزار تێکەڵاوکردن بۆ دابەشکردنی بە یەکسانی لەناو میراتبەری مردوویەکدا کە وەسیەتنامەی بەجێ نەهێشتبێ.

**hotch-potch** (hoch'poch'), ***n.*** (١) جێشتی شلە (٢) جێشتی مجەوەر؛ شتی تێکەڵاووپێکەڵاو (٣) hotchpot

**hot dog,** (١) حواردنێکە لە گۆشتی کوتراوی بەراز، گا، یا قەل دەکرێت لە شێوەی لوولەدایە درێژی ٤–٥ گرێ و ئەستووری گرێیەك دەبێت. (٢) [Colloq.]، ووتەیەکە ڕەزامەندیی و پەسەندکردن و خۆشی دەردەبڕێت.

**hotel** (hō-tel'), ***n.*** ئوتێل؛ خان؛ میوانخانە

**hothead** (hot'hed'), ***n.*** کەسێکی سەرگەرمی توورەوتڕۆ؛ سەرچڵ.

**hotheaded** (hot'hed'id), ***adj.*** سەرگەرم؛ توورەوتڕۆ؛ سەرچڵ؛ سەرشێت؛ زووهەڵچوو؛ هەڵەشە.

**hothouse** (hot'hous'), ***n.*** شەتڵگای بە شووشە دەورگیراوی گەرم؛ جامخانەی گەرمی ڕووەك و ئەمام.

**hot rod, hot-rod,** [Slang], ئوتومبێلێکە مەکینەکەی دەستکاری دەکرێت بۆ بە گوڕتر و بەهێزترو گرمە زلترکردنی.

**hot spring,** کانیاو؛ کانیاوی گەرم.

**hot spur** (hot'spūr'), ***n.*** کەسێکی هەڵەشەی سەرگەرم.

**hot-tempered** (hot'tem'pērd), ***adj.*** سەرگەرم؛ توورەوتڕۆ؛ تەنگەتیلکە؛ زووهەڵچوو

**hot toddy, toddy,** براندی یا ویسکی تێکەڵاوکراو لەگەڵ ئاوی گەرمدا.

**hot water,** (١) ئاوی گەرم. (٢) [Colloq.]، ( in ~ ) تەنگوچەڵەمە؛ گێژاو؛ ناخۆشی.

**hound** (hound), ***n.*** (١) تانجی؛ سەگی ڕاو. (٢) سەگ. (٣) کەسێکی بێ نرخی بۆگەن.

***v.t.*** (١) ڕاوکردن؛ دواکەوتن و لەکۆڵ نەبوونەوە؛ شوێن کەوتنی ناحەزانە. ***( Tax collectors ~ him.)*** (٢) هاندان؛ تێ کردن (سەگ).

**hour** (our), ***n.*** (١) سات؛ سەعات (کات). (٢) (ا) کاتێکی تایبەتی: ***( the dinner ~ )*** . (ب) کات: ***( He spent his happiest ~s in Paris.)*** . (ج) ماوەی وانەیەك لە قوتابخانەدا؛ وانە: ***( The ~ lasts fifty minutes.)*** (د) (*pl.*) کاتی دەوام یا کارکردن: ***( His office ~s are from 1-5.)*** (هـ) (*pl.*) کاتی لە خەوهەڵسان و نوستن: ***( He keeps late ~s.)*** (٣) کاتی ڕۆژ یا شەو: ***( The ~ is 2:30 .)*** . (٤) سات (هی ڕێگە یا چەند خایاندنی): ***( It is three ~s from New York to Washington by rail.)*** (٥) (ا) کاتی نوێژکردنی ڕۆژانە (خاچ پەرستی). (ب) ئەم نوێژە.

**after hours,** دوای دەوام یا کاتی کارکردن.

**at the eleventh hour,** لە دوا سەعاتدا؛ لە دوا هەناسەدا؛ درەنگ.

**hour after hour,** هەموو ساتێك؛ سەعات لە دوای سەعات.

**hour by hour,** سەعات بە سەعات؛ هەر ساتی جارێك.

**of the hour,** هی ئێستا؛ هی ئەمڕۆ

**one's hour,** کاتی مردن؛ کاتی گیان دەرچوون.

**the small ( or wee ) hours,** پاش نیوەشەو.

**hourglass** (our'glas', our'gläs'), ***n.*** کاتژمێری لم

**hour hand,** دەستی کاتژمێر

**houri** (hoo'ri, hou'ri), ***n.*** (١) حۆری. (٢) ئافرەتێکی جوان.

**hourly** (our'li), ***adj.*** (١) هەر ساتی جارێك؛ ساتانە؛ هەموو ساتێك. (٢) ماوەی ساتێك؛ ساتی؛ لە ساتێکدا: ***( The ~ output)*** (٣) زوو زوو؛ بەردەوام

**house** (hous), ***n.*** (١) (ا) خانوو. (ب) ماڵ. (٢) (ا) کۆلێجی زانکۆیەك. (ب) ئوتێل؛ خان. (ج) شوێنی ژیانی تاقمێك: ***( a fraternity ~ )*** . (د) تەکیە؛ قەڵەندەرگا. (٣) خێزان؛ ماڵ. (٤) [H-] هۆز (بەتایبەتی هی ناودارو خانەدان)؛ بنەماڵە؛ خێڵ: ***( The H~ of Tudor)*** (٥) (ا) لانە؛ پەناگا: ***( the monkey ~ in a zoo)*** . (ب) عەمار؛ جێی هەڵگرتنی شتێك لەکاتی بەکارنەهێنانیدا: ***( a carriage ~ )*** (٦) جێنشین؛ مەڵبەند؛ ئارامگا. (٧) (ا) شانۆ؛ سینەما. (ب) تەماشاکەرانی شانۆ یا سینەما. (٨) (ا) جێی کاروکاسبی؛ جێی بازرگانی. (ب) دەزگای بازرگانی: ***( a printing ~ )*** . (٩) کڵێسە؛ کەنیشتە؛ پەرستگا. (١٠) (ا) خانووی پەرلەمان. (ب) [H-]، پەرلەمان؛ ئەنجومەنی نوێنەران: ***( The H~ of Representatives)*** (١١) (ا) بورجی گەردوون. (ب) نیشانەی ئەم بورجە. (١٢) (ا) ئوتێل؛ مەیخانە؛ چێشتخانە: ***( to have a drink on the ~ )*** .

(ب) [Slang]. قەحبەخانە

*v.t.* (١) جێکردنەوە؛ خانوو یا ژوور پێدان.

(٢) جێ تیابوونەوە: *( The building ~s ten people.)*.

(٣) پەنادان؛ لانەدان؛ لانەپێدان؛ جێکردنەوە.

(٤) عەمارکردن؛ هەڵگرتن.

*v.i.* تێدا دانیشتن؛ تێدابوون.

**bring down the house,** [Colloq.], کردن بە چەپڵەڕێزان (کۆڕ).

**clean house,** (١) ماڵ پاککردنەوەو ڕێکخستن.

(٢) لابردنی شتی ناخۆش و ناپەسەندو لەکۆڵ خۆکردنەوەی.

**keep house,** کەیبانوێتی کردن؛ ئیش وکاری ماڵ کردن.

**on the house,** بەلاش؛ خۆڕایی؛ لەسەر خاوەن چایخانە، بار، چێشتخانە، یا ئوتێلەکەیە *( to have a drink on the house)*.

**set ( or put ) one's house in order,** کاروباری خۆ ڕێک وپێک کردن.

**house arrest,** بەندکردن لە ماڵی خۆدا لەباتی بەندیخانە.

**houseboat** (hous'bōt'), *n.* بەلەمێکە وەک ماڵ بۆ تیا ژیان بەکاردەهێنرێت.

**house-breaker** (hous'brāk'ẽr), *n.* ماڵبڕ؛ دزی ماڵ.

**house-breaking** (hous'brāk'iŋ), *n.* ماڵ بڕین؛ ماڵ دزین.

**house-broken** (hous'brō'k'n), *adj.* فێرکراوە پیسایی لە شوێنی تایبەتیدا بکات نەک لە ناوماڵدا (سەگ و پشیلە)

**house-dress** (hous'dres'), *n.* کراسی ناوماڵ (هی ئیشکردن).

**housefly** (hous'flī'), *n.* مێشی ناوماڵ؛ مێش.

**houseful** (hous'fool'), *adj.* پڕ بە ماڵێک؛ ئەوەندەی ماڵەکە جێی تێدابێتەوە؛ بە پڕی: *( a ~ of guests)*

**household** (hous'hōld'), *n.* خێزان؛ ماڵ؛ ماڵ ومندال.

*adj.* هی ماڵ و خێزان: *( ~ affairs)*.

**household arts, = home economics.**

**householder** (hous'hōl'dẽr), *n.* گەورەی ماڵ؛ خاوەن ماڵ؛ سەرگەورەی ماڵ.

**household word,** وتەیەک یا ناوێک کە هەمووکەس بیزانن و لەسەر زمانی هەمووکەس بێت: *( His name is not quite a ~ . )*.

**housekeeper** (hous'kēp'ẽr), *n.* (١) کەیبانو؛ ژنی ناوماڵ؛ بنەوان.

(٢) کارەکەر؛ سەرکاری کارەکەرو بەردەستی ماڵێک (ژن)

**housekeeping** (hous'kēp'iŋ), *n.* ماڵداری؛ ئیشی ناوماڵ کردن؛ ئیشی ناوماڵ؛ کەیبانوێتی.

**housemaid** (hous'mād'), *n.* کارەکەر

**housemother** (hous'mu*th*'ẽr), *n.* چاودێر یا بەڕێوەبەری خانەی قوتابیانی کوڕ یا کچ (ژن)؛ کەیبانووی خانەی قوتابیان.

**house of cards,** شتێک کە بە ئاسانی بڕووخێت یا هەرەس بەرێت

**House of Commons,** ئەنجوومەنی پەرلەمانی گشتی یا جەماوەری ئینگلتەرەو کەنەدا.

**house of correction,** بەندیخانەی ڕاستکردنەوە (بۆ ئەوانەی تاوانی بچووکیان کردووە)؛ بەندیخانەی تەمێکردن؛ تەمێخانە.

**House of Lords,** ئەنجوومەنی پەرلەمانی لۆردەکانی ئینگلتەرە.

**House of Representatives,** ئەنجوومەنی نوێنەران، واتە پەرلەمانی ئەمەریکاو ئوسترالیاو نیوزیلەندەو مەکسیک.

**house organ,** نامیلکەی کۆمپانیایەک بۆ فەرمانبەرەکانی خۆی

**house party,** (١) ئاهەنگێکی چەند شەوو ڕۆژی یا هیچ نەبێ یەک شەوو ڕۆژی لە ماڵێکدا (٢) میوانەکانی ئەم ئاهەنگە

**house physician,** (١) پزیشکی جێنشینی خەستەخانە.

(٢) پزیشکی جێنشینی هەندێ دەزگای وەک ئوتێل.

**house-room** (hous'rōōm', hous'room'), *n.* ژووری ماڵێک (بۆ دانیشتن و نوستن یا شت هەڵگرتن)

**housetop** (hous'top'), *n.* سەربان

**housewares** (hous'wârz'), *n.pl.* دەفری ناوماڵ (قاپ و قاچاخ و شتی وەها).

**housewarming** (hous'wôr'miŋ), *n.* ئاهەنگی گواستنەوە بۆ ماڵێکی تر یا تازە (خاوەن ماڵ دەیگێڕێت).

**housewife** (hous'wīf'), *n.* (١) کەیبانوو؛ بنەوان؛ ژنی ناوماڵ.

(٢) قوتووی دەرزی و دەزوو.

**housewifely** (hous'wīf'li), *adj.* هی کەیبانوو یا بنەوان؛ تایبەتی بە ئیشی ناوماڵ.

**housewifery** (hous'wīf'ẽr-i, hous'wīf'ri), *n.* کەیبانوێتی؛ بنەوانی؛ ئیشی ناوماڵ.

**housework** (hous'wũrk'), *n.* ئیشی ناوماڵ؛ ئەرکی ناوماڵ.

**housing** (houz'iŋ), *n.* (١) خانوو بۆ دۆزینەوەو پێدان.

(٢) خانوو؛ خانوو بە گشتی. (٣) خانەسازی: *( the ~ problem)*

(٤) (ا) پەناگا؛ پەنا؛ شوێنی حەوانەوە؛ پاراستنگا.

(ب) ماڵ یا جێی پارچەی مەکینەیەک.

(٥) شوێنی سەری دەستەک و ئیرگە تێخستن یا تیادانان.

(٦) قوژبنی پەیکەر تیادانان.

**housing** (houz'iŋ), *n.* (١) سەرزین. (٢) (کۆ) شتی ڕازاندنەوە.

**hove** (hōv), *alternative past tense and p.p. of* **heave.**

**hovel** (huv''l, hov''l), *n.* (١) پەچە؛ کۆز. (٢) کوختە؛ کووخ.

*v.t.* جێکردنەوە لە کوختەدا؛ پەناپێدان لە کوختەیەکدا.

**hover** (huv'ẽr, hov'ẽr), *v.i.* (١) بە ئاسمانەوە وەستان (باڵندە، فڕۆکە). (٢) ( **~ around; ~ near** )، لەنزیکەوە یا بەسەر سەرەوە وەستان و چاودێری کردن.

**how** (hou), *adv.* (١) بەچی جۆرێک؛ چۆن (ڕێ، شێوە): *( He showed us ~ to work the machine.)*

(٢) چۆن: *( H~ are you? ; H~ does she feel?)*.

(٣) چەند؛ تا چی ڕادەیەک: *( H~ do you like that?)*.

(٤) بۆ؛ بۆچی؛ چۆن (هۆی کردنی کارێک): *( H~ is it that you don't know?)*

(٥) بە چەند (نرخ): *( H~ are these shirts sold on sale?)*

(٦) چۆن (ماناوچۆن): *( H~ should I interpret this?)*.

(٧) ناوی چییە؛ بە چی ناوێک بانگ دەکرێت: *( H~ is she called?)*.

(٨) چی؟ (بۆ دووبارەکردنەوەی وتە): *( H~ is that again?)*.

*n.* شێوەی کردن؛ چۆنێتی؛ ڕێباز؛ شێواز؛ ڕێگە: *( Show me the ~ of it.)*

**how about?** ڕات چییە دەربارەی؟؛ مەستت چۆنە لە بابەت.

**how come?** بۆچی؟؛ بۆ؟: *( How come you are so late?)*

**how now?** ئەمە چییە؟؛ ئەمە مانای چییە؟؛ ئەمە بۆچی وایە؟.

**how so?** بۆچی؟؛ بۆ؟.

**How do you do?,** چۆنی (وتەیەکە دەوترێت لە ناسینی خەڵکدا بۆ یەکەم جار وە کەسەکەی تریش لە وەڵامدا هەمان وتە دەڵێتەوە)

**howdy** (hou'di), *interj.* [Dial. or Colloq.], چۆنی؟؛ مەرحەبا؟؛ ئەم کاتەت باش.

**however** (hou-ev'ẽr), *adv.* (١) هەرچۆنێک بێت؛ بە هەرشێوەیەک بێت. (٢) تا هەر چ ڕادەیەک بێت.

*conj.* لەگەڵ ئەوەشدا؛ بەڵام.

**howl** (houl), *v.i.* (١) لووراندن (گورگ، سەگ)؛ حەچولوورکردن.

(٢) ناڵاندن؛ هاوارکردن؛ قیژاندن؛ گریان.

(٣) گڤەگڤ کردن (با)؛ لووراندن (با): *( The wind ~ed.)*.

*v.t.* (١) دەربڕین بە لوورە؛ لووراندن.

(٢) مەبەستی خۆ جێبەجێکردن بە لوورە؛ هاوار بەسەردا کردن.

*n.* لوورە؛ لوورەلوور؛ گڤەگڤ؛ قیژە؛ ناڵە؛ هاوار.

**howl down,** قسە پێ بڕین بە هاوار هاوارو قیژە قیژ (وتاربێژ): *( to howl down a speaker)*

**howler** (houl′ēr), *n.* (١) لوورەلوورکەر؛ هاوارکەر
(٢) مەیموونی لوورەلوورکەر. (٣) [Colloq.]، هەڵەیەکی کەرانە.
**howler** (houl′ēr), *n.* [Archaic], = **owl.**
**howlet** (hou′lit), *n.* [Archaic], = **owl.**
**howsoever** (hou′sō-ev′ēr), *adv.* (١) تا هەر چ رادەیەك بێت.
(٢) هەرچۆنێك بێت؛ بە هەرشێوەیەك بێت؛ هەرچۆن بێت.
**hoy** (hoi), *n.* (١) کەشتییەکی کۆنباوی بچووك. (٢) کەشتی بار.
**hoy** (hoi), *interj.* هۆی: هاوارێکە بۆ سەرنج ڕاکێشان یا وڵاخ لێخوڕین.
**hoyden** (hoi′d'n), *n.* کچە کوڕانی؛ کچێکی جەربەزەی چەقاوەسوو
*adj.* جەربەزەو چەقاوەسوو.
-hoydenish *(adj.).*
**hub** (hub), *n.* (١) تۆپ یا تەوەرەی پێچکە، پانکە، یا پەروانەیەك.
(٢) ناوجەرگەی جموجووڵو چالاکی؛ ناوجەرگە؛ چەق:
*( That place is the ~ of activity.)*
**hubble-bubble** (hub′'l-bub′'l), *n.* (١) نێرگەلە.
(٢) هەراهەرا؛ غەڵبەغەڵب؛ ژاوەژاو؛ دەنگەدەنگ.
**hubbub** (hub′ub), *n.* غەڵبەغەڵب؛ ژاوەژاو؛ دەنگەدەنگ
**hubris** (hū′bris), *n.* شانازی؛ لەخۆبایی بوون.
**huckleberry** (huk′'l-ber′i), *n.* تووترك (دارو بەر).
**huckster** (huk′stēr), *n.* (١) چەرچی؛ فرۆشیاری گەڕۆك
(٢) فرۆشیاری شتومەك لەسەر ڕادیۆو تەلەفزیۆن.
(٣) [Slang]، نووسەری بڵاونامەی شت فرۆشتن بۆ ڕادیۆو تەلەفزیۆن.
*v.t.* (١) شت فرۆشتن؛ چەرچێتی کردن. (٢) سەوداکردن.
**huddle** (hud′'l), *v.i.* (١) سەر بەیەکەوە نان؛ کۆمەڵ بوون؛ خڕبوونەوە:
*( Animals ~ together from fear or for warmth.)*
(٢) خۆ خزانەناو. (٣) ڕاوێژکردن؛ کۆمەڵ بوون بۆ ڕاوێژکردن.
*v.t.* (١) کۆمەڵ کردن؛ گردکردنەوە؛ کۆکردنەوە.
(٢) خۆ نزیك کردنەوە؛ خۆ خزانەناو. (٣) بە پەلەو لامسەرلایی کردن.
(٤) خستنەناو بە پەلەو شپرزەیی و ناڕێكوپێکی:
*( He ~d the children into the automobile.)*
*n.* (١) کۆمەڵێکی ناڕێكوپێكو شێواو (ئادەمی، شتومەك).
(٢) شێواوی؛ شێوان؛ ناڕێكوپێکی.
(٣) کۆڕێکی نهێنی؛ ڕاوێژو گفتوگۆی نهێنی.
(٤) کۆڕێکی کورتی تیپی یاری (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
**go into a huddle,** [Slang]. کۆڕی نهێنی گرتن.
**hue** (hū), *n.* ڕەنگ
**hue** (hū), *n.* هاوار؛ هەراهەرا؛ هاوار هاوار.
**hue and cry,** (١) (ا) هاوار هاواری ئەوانەی شوێن تاوانبارێك دەکەون
بۆ گرتنی. (ب) ئەم شوێن کەوتنە.
(٢) هەراوزەنا؛ هەرا هەراو ناڕەزایی دەربڕین؛ هەراو هوریا:
*( to raise a hue and cry against a politician)*
**hued** (hūd), *adj.* ڕەنگدارێکی تایبەتی: *( rosy- ~ ; many- ~ )* .
**huff** (huf), *v.t.* (١) فووتێکردن؛ ئاوساندن.
(٢) بەچەترسێن کردن؛ هەڕەشەلێکردن. (٣) تووڕەکردن؛ زویرکردن.
*v.i.* (١) ئاوسان.
(٢) [Obs.]، فووتێکران (لووت بەرزیو لەخۆبایی بوون).
(٣) پیش خواردنەوە؛ زویربوون؛ پەست بوون: *( ~ing and puffing.)* .
*n.* پیش خواردنەوە؛ تووڕەیی؛ هەڵچوون؛ شێتگیری؛ تەنگەتیلکەیی.
**huffish** (huf′ish), *adj.* (١) لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ بەفیز.
(٢) تەنگەتیلکە؛ پیش خۆرەوە؛ زوو تووڕەبوو؛ مۆن؛ تەنگەجیکڵانە؛
دەموچاو گرژ
-huffishly *(adv.)*; huffishness *(n.).*
**huffy** (huf′i), *adj.* (١) تەنگەجیکڵانە؛ زووهەڵچوو؛ زوو تووڕەبوو؛
هەست ناسك. (٢) تووڕە؛ زویر.
(٣) [Obs.]، لەخۆبایی؛ لووت بەرز؛ بەفیز.

-huffily *(adv.)*; huffiness *(n.).*
**hug** (hug), *v.t.* (١) باوەش پیاکردن. (٢) ووشین لە باوەشدا.
(٣) واز لێ نەهێنان (بیروڕا، ڕێباز)؛ دەست لێ بەرنەدان.
(٤) بەرنەدان؛ گرتن؛ نەڵیی باوەشی پیادەکات:
*( The automobile ~ged the curb.)*
*v.i.* باوەش پیاکردن؛ باوەش بەیەکتردا کردن.
*n.* (١) باوەش؛ باوەش پیاکردن. (٢) ووشین (لە باوەشدا).
**huge** (hūj), *adj.* زۆر زل؛ زۆر گەورە؛ فیلەتەن؛ قەبە؛ کەتە (مرۆڤ).
-hugely *(adv.).*
**hugger-mugger** (hug′ēr-mug′ēr), *n.* (١) تێکەڵاویوپێکەڵاوی؛
شێواوی. (٢) [Archaic]، نهێنیتی.
*adj.* (١) تێکەڵاوپێکەڵاو؛ شێواو.
(٢) [Archaic]، نهێنی.
*adv.* (١) بە تێکەڵاویوپێکەڵاوی؛ بە شێواوی.
(٢) [Archaic]، بە نهێنی.
**huh** (hu), *interj.* هە؟!: دەنگێکە بۆ پرسیارکردن، بە سووك سەیرکردن،
سەرسامی دەربڕین.
**hulk** (hulk), *n.* (١) (ا) کەشتی. (ب) کەشتییەکی زلی ناقۆڵا.
(٢) قاوغی کەشتییەکی کۆن. (٣) *(pl.)* لاشە یا قاوغی کەشتییەکی کۆن یا
یەکێکی وەها کە درووست نەکراوە بەو نیازەی گەشتی دەریایی بکات وە
کراوە بە بەندیخانە یا عەمار. (٤) کەسێك یا شتێکی زلو ناقۆڵا
*v.i.* (١) بە زلیو قەبەیی بەرز دەبێتەوە.
(٢) [Dial.]، دانیشتن، وەستان، یا جووڵانەوە بە ناقۆڵاییو شان خواریو
لەش قورسانە.
**hulking** (hul′kiŋ), *adj.* قەبەو ناقۆڵا.
**hulky** (hul′ki), *adj.* = **hulking.**
**hull** (hul), *n.* (١) توێك (گەنم، جۆ، چەڵتووك)؛ سۆس؛ کەپەك؛
توێکڵ (گوێز، بادەم)؛ کەلوو (پاقلە، لۆبیا). (٢) وورده گەڵای دەوری شلیكو
تووترك. (٣) قاوغ؛ بەرگ؛ سەر؛ توێك؛ توێخ.
*v.t.* توێك لێکردنەوە؛ توێکڵ لێکردنەوە؛ پاك کردن.
**hull** (hul), *n.* (١) چوارچێوە یا لاشەی کەشتی.
(٢) چوارچێوەی فڕۆکەی ئاوی.
(٣) قاوغ یا چوارچێوەی کەشتی ئاسمانی یا مووشەك.
*v.t.* لێدانو کونکردنی لاشەی کەشتی بە بۆمبا.
**hullabaloo** (hul′ə-bə-loo′, hul′ə-bə-lōō′), *n.* هەراوهوریا؛
هەراوزەنا؛ دەنگەدەنگ؛ غەڵبە غەڵب.
**hum** (hum), *v.i.* (١) ووزەووزکردن (هەنگ)؛ ڤرەڤرکردن (پانکەی-
ئەلەکتریکی). (٢) هەمهەم کردن؛ لەبەر خۆوە ئاوازی گۆرانی ووتن بەبێ
دەم کردنەوە.
(٣) دەنگدانەوە: *( The room ~med with voices.)* .
(٤) [Colloq.]، سەرقاڵ بوون؛ هەمیشە لە جموجووڵ بوون.
*v.t.* (١) لەبەرخۆوە ئاوازی گۆرانی ووتن بەبێ دەم کردنەوە.
(٢) لایلایە بۆ کردن: *( to ~ a child to sleep)* .
*n.* (١) لەبەر خۆوە ئاوازی گۆرانی ووتن بەبێ دەم کردنەوە.
(٢) ووزەووز؛ ڤرەڤر.
**hum** (həm), *interj.* (١) ئەهەم: دەنگی قوڕگ پاککردنەوە.
(٢) هم: دەنگێکە خۆشی، سەرسامی، یا بە سووك سەیرکردن دەردەبڕێ
*v.i.* (١) پرتەکردنی یەکێك لەم دەنگانەی پێشوو.
(٢) منجەمنج کردن لە دوواندا.
**human** (hū′mən), *adj.* مرۆڤی؛ ئادەمی؛ ئادەمیزادی؛ مرۆڤانە؛
ئادەمیزادانە.
*n.* مرۆڤ؛ ئادەمیزاد؛ ئادەمی.
**human being,** مرۆڤ؛ ئادەمیزاد؛ ئادەمی؛ کەس.
**humane** (hyoo-mān′), *adj.* (١) بە بەزەیی؛ بە ڕەحم؛ دڵ بە خەڵك
سووتاو؛ مرۆڤانە. (٢) مرۆڤی؛ پەروەردەکەرو بە برەوکەری ڕەفتاری مرۆڤانەی

جوان وەك دڵ بە خەڵك سووتان: *( a ~ education)* .

**humanism** (hū′mən-iz'm), ***n.*** (١) سروشتی ئادەمیزاد؛ ئادەمیزادی؛ مرۆڤی. (٢) فەلسەفەو ڕێبازی مرۆڤایەتی کە ژیانی ئادەمیزاد لەم جیهانەدا بە گرنگتر دادەنێ لە لێکۆڵینەوەی ئاین و شتی مانایی و نەبینراو. (٣) لێکۆڵینەوەو خوێندنی زانست و هونەری مرۆڤایەتی. (٤) [H-] بزووتنەوەی مرۆڤایەتی کە لە سەدەی بزووتنەوەدا ڕوویدا لە ئەورووپا و بریتی بوو لە خوێندن و لێکۆڵینەوەی وێژەو هونەرو ژیواری یۆنان و ڕۆمانی کۆن

**humanist** (hū′mən-ist), ***n.*** (١) قوتابی یا زانای ئەدەب و کلتووری یۆنانی و لاتینی. (٢) قوتابی یا زانای سرووشت و کاروبارو خۆش گوزەرانی مرۆڤ؛ مرۆڤ پەرست. (٣) قوتابی یا زانای باسە ئادەمیزادی‌یەکان.

**-humanistic** ***(adj.)***; **humanistically** ***(adv.)***.

**humanitarian** (hyoo-man′ə-târ′i-ən), ***n.*** مرۆڤ پەرست؛ چاکەکەر: کەسێك کە چاکەوخۆشی و خۆش گوزەرانی هەموو مرۆڤێکی بوێت؛ پیاوی چاك و بە بەزەیی.

***adj.*** مرۆڤ پەرست؛ چاکەکەر: خۆشی و چاکەو خۆش گوزەرانی مرۆڤ خواست؛ بەبەزەیی *( a ~ act )*

**humanitarianism** (hyoo-man′ə-târ′i-ən-iz'm), ***n.*** (١)- مرۆڤ پەرستی: چاکەوخۆشی و خۆش گوزەرانی مرۆڤ ویستن؛ چاکەکردن؛ دڵ بە مرۆڤ سووتان. (٢) فەلسەفەیەکە کە دەڵێت ئەرکی سەرشانی مرۆڤ تەنها مرۆڤ پەرستی و چاکەو خۆش گوزەرانی مرۆڤ ویستنە. (٣) بڕوانەبوون بە خوایەتی عیسا (ڕێبازی ئاینی).

**humanity** (hyoo-man′ə-ti), ***n.*** (١) سرووشتی مرۆڤ. (٢) (*pl.*) مرۆڤایەتی؛ هەستی باشی ئادەمیزادێتی. (٣) خەڵك: مرۆڤ؛ هەموو مرۆڤ؛ توخمی ئادەم. (٤) بەرەحمی: بەزەیی هاتنەوە؛ دڵ سووتان بە خەڵك.

**the humanities,** (١) وێژەو زمان بەتایبەتی هی لاتینی و یۆنانی. (٢) زانستی‌یەکانی مرۆڤ؛ ئەو زانستانەی دەربارەی مرۆڤن وەك وێژەو فەلسەفە (هەندێ جار هونەرو مێژوویش).

**humanize** (hū′mə-nīz′), ***v.t.*** (١) بە مرۆڤ کردن: خووڕەوشتی مرۆڤ پێدان. (٢) ڕەفتار پوختەو جوان و خاوێن کردن؛ کردن بە مرۆڤێکی چاك و بەبەزەیی: کردن بە مرۆڤ پەرست.

***v.i.*** بوون بە مرۆڤ پەرست؛ ڕەووشت چاك بوون.

**-humanization** ***(n.)***.

**humankind** (hū′mən-kīnd′), ***n.*** توخمی ئادەم؛ ئادەمیزادان؛ خەڵك: مرۆڤ؛ هەموو مرۆڤ

**humanly** (hū′mən-li), ***adv.*** (١) مرۆڤانە؛ ئادەمیزادانە (٢) ئەوەی لە توانای مرۆڤدا بێت؛ لەڕێی مرۆڤانەوە: ***( to do everything ~ possible to help them)*** (٣) بەپێی شارەزایی و زانینی مرۆڤ.

**humble** (hum′b'l), ***adj.*** (١) بێ فیز: بێ هەوا؛ خاکی؛ ڕیسوا؛ ملکەچ؛ سەرکز؛ بێ ناز: *( a ~ man, woman, etc.)* . (٢) (ا) نزم (پلەوپایە، پیشە)؛ فەقیر: ***( a man of ~ birth; a ~ occupation)*** (ب) مام ناوەندی؛ فەقیرانە: *( a ~ home)* .

***v.t.*** ملکەچ کردن؛ فیز شکاندن؛ سەر پێ دانەواندن؛ ڕیسواکردن: ***( to ~ one's enemies; to ~ oneself before God)***

**-humbleness** ***(n.)***.

**humblebee** (hum′b'l-bē′), ***n.*** = **humble-bee.**

**humbly** (hum′bli), ***adv.*** (١) بێ فیزانە؛ خاکی‌یانە؛ ملکەچانە. (٢) بە ڕیسوایی؛ بە لووت شکاوی؛ بە سەردانەواوی (٣) بە فەقیرانە؛ لە پلەوپایەی نزمەوە.

**humbug** (hum′bug′), ***n.*** (١) ساختە؛ فێڵ وتەڵەکە؛ دەسبڕین. (٢) قسەی بۆش و ساختەبازانە؛ قسەی قۆڕو هیچ وپووچ. (٣) کەسێکی دەسبڕ، ساختەچی، کەڵەکچی، یا بەفریوبەر. (٤) ساختەچێتی؛ فێڵبازی؛ دەسبڕی.

***v.t.*** دەسبڕین؛ بە فریوبردن؛ خەڵەتاندن؛ ساختەلێکردن.

**-humbugger** ***(n.)***; **humbuggery** ***(n.)***.

**humdinger** (hum′diŋ′ẽr), ***n.*** [Slang]، مرۆڤ یا شتێکی زۆر نایاب.

**humdrum** (hum′drum′), ***adj.*** ووشك و ناخۆش (ژین، فرمان).

***n.*** (١) کەسێکی ووشك و بێ تاقەت کەر. (٢) گفتوگۆی ووشك و ناخۆش و بێ تاقەت کەر؛ ووشکی (مەجان).

**humid** (hū′mid), ***adj.*** تەڕ (هەوا، ئاووهەوا)؛ شێدار (هەوا): ***( ~ air; ~ weather)***

**humidifier** (hyoo-mid′ə-fī′ẽr), ***n.*** شێدارکەری هەوا (ئامێر)؛ تەڕکەری هەوای ناومال.

**humidify** (hyoo-mid′ə-fī′), ***v.t.*** شێدارکردن یا تەڕکردنی هەوای ناومال بە ئامێر (بۆ ئەوانەی نەخۆشی تەنگەنەفەسی‌یان هەیە).

**-humidification** ***(n.)***.

**humidity** (hyoo-mid′ə-ti), ***n.*** (١) شێداری (ئاووهەوا). (٢) پلەی شێداری (ئاووهەوا).

**humiliate** (hyoo-mil′i-āt′), ***v.t.*** ڕیسواکردن؛ ئابڕووبردن؛ سەر پێ شۆڕکردن؛ چاوشکاندن؛ ڕووشکاندن؛ مل پێ شۆڕکردن؛ لووت شکاندن؛ شکاندن؛ شەرەف بردن.

**humiliating** (hyoo-mil′i-āt′iŋ), ***adj.*** شەرمەزارکەر (کردار، ڕوودان)؛ ڕیسواکەر: شەرەف شکێن؛ سەرشۆڕکەر؛ چاوشکێن.

**humiliation** (hyoo-mil′i-ā′shən), ***n.*** ڕیسوایی: شەرمەزاری؛ سەرشۆڕی؛ چاوشۆڕی؛ مل شۆڕی؛ ڕیسوابوون؛ شکان.

**humility** (hyoo-mil′ə-ti), ***n.*** (١) بێ فیزی؛ بێ هەوایی؛ سەرکزی؛ ملکەچی. (٢) (*pl.*) کردەوەی بێ فیزانەو ملکەچانە.

**humming-bird** (hum′iŋ-bũrd′), ***n.*** جۆرە باڵندەیەکی زۆر بچووکە وەك فیسقە وایە؛ ویزەویزە.

**hummock** (hum′ək), ***n.*** (١) تەپۆڵکە؛ گردۆڵکە. (٢) گردۆڵکەی ناوی زەوی‌یەکی سەهۆڵ بەندان. (٣) گردۆڵکەیەکی چڕی نزیك زۆنگاوێك.

**humor, humour** (hū′mẽr, ū′mẽr), ***n.*** (١) شلەی ناو لەشی گیاندار یا ڕووەك. (٢) سروشتی مرۆڤ؛ باری مێشك و هەست. (٣) هەوەس. (٤) گاڵتەوگەپ؛ گاڵتەوپێکەنین. (٥) قۆشمەچێتی؛ گاڵتەچێتی؛ نوکتەچێتی؛ گاڵتەبازی. (٦) هەستی قۆشمەچێتی بوون. (٧) نەخۆشی پێست.

***v.t.*** دڵ ڕاگرتن؛ لاواندنەوە؛ نازکێشان؛ دڵ نەوایی کردن؛ دڵ نەشکاندن.

**sense of humor,** هەستی قۆشمەچێتی؛ توانای گاڵتەوگەپ کردن؛ نوکتەچێتی: ***( He has a sense of humor.)*** .

**out of humor,** زویر؛ بێ تاقەت؛ ڕووناخۆش؛ پەست.

**humorist** (hū′mẽr-ist, ū′mẽr-ist), ***n.*** قۆشمەچی؛ گاڵتەباز؛ نوکتەچی.

**-humoristic** ***(adj.)***.

**humorous** (hū′mẽr-əs, ū′mẽr-əs), ***adj.*** (١) ئەنتیکە؛ هێنەرەپێکەنین؛ سەیر: ***( a ~ sight, event, etc.)*** . (٢) قۆشمە؛ قۆشمەچی؛ سەیرخۆش؛ قسەخۆش؛ ئەنتیکە(مرۆڤ)؛ نوکتەچی ***( a ~ person)***

**humour** (hū′mẽr, ū′mẽr), ***n. & v.t.*** = **humor.**

**hump** (hump), ***n.*** (١) کۆپارەی حوشتر؛ پشت کۆمی (نەخۆشی)؛ قۆرتاوی؛ قۆرتی سەر پشت (٢) تەپۆڵکە؛ گردۆڵکە. (٣) پەستی؛ غەمباری؛ دڵتەنگی.

***v.t.*** (١) کۆماندنەوە؛ نوشتاندنەوە: ***( The cat ~ped its back.)*** . (٢) [Slang]، خۆ ماندووکردن. (٣) [Slang]، سۆك پێوەدان؛ کوت پێوەدان؛ گاین؛ لەگەڵ جووت بوون.

**humpback** (hump′bak′), ***n.*** (١) پشت کۆمی؛ قەمووری. (٢) کەسێکی پشت کۆم؛ قەموور. (٣) نەهەنگێکی گەورەی کۆپارەدار

**humpbacked** (hump′bakt′), *adj.* پشت کۆم؛ قەموور

**humped** (humpt), *adj.* = **humpbacked.**

**humpy** (hump′i), *adj.* (١) قۆرتاوی؛ کۆپارەدار. (٢) لە کۆپارە یا قۆرت چوو.

**humus** (hū′məs), *n.* گیاو پووەکی گەنیوی رەش داگیرساو کە دەبێتە پەین بۆ زەوی.

**hunch** (hunch), *v.t.* کۆم کردنەوە؛ نوشتاندنەوە (پشت)؛ کۆماندنەوە: *( Don't ~ your back.)*

*v.i.* پاڵ نان بۆ پێشەوە

*n.* (١) کۆپارە (حوشتر)؛ کۆمی؛ قەمووری. (٢) تۆپەڵ؛ کۆمەڵ؛ قۆرت.
(٣) [Colloq.]. دڵ خەبەردان بە ڕوودانی شتێك باش بێت یا خراپ؛ هەست وا بوون: هەست وا کردن؛ وا زانین: *( I have a ~ we will win this time.; I have a ~ we are being tricked.)*

**hunchback** (hunch′bak′), *n.* (١) پشتی کۆماوە؛ پشتی قەموور. (٢) کەسێکی پشت کۆم یا قەموور.

**hunchbacked** (hunch′bakt′), *adj.* = **humpbacked.**

**hundred** (hun′drid), *n.* (١) سەد (٢) سەد دۆلارییەك.

**hundredfold** (hun′drid-fōld′), *adj., adv. & n.* سەدنەوەندە؛ سەد قات

**hundredth** (hun′dridth), *adj. & n.* (١) سەدەم؛ سەدەمین. (٢) سەدیەك؛ یەك لەسەر سەد.

**hung** (huŋ), *past tense and past participle of* **hang.**

**Hungarian** (huŋ-gâr′i-ən), *adj.* هەنگاری؛ مەجەری (گەل و زمان و کلتوور)

*n.* (١) هەنگارییەك؛ هاوولاتییەکی مەجەر یا هەنگاریا. (٢) زمانی مەجەری یا هەنگاری.

**hunger** (huŋ′gẽr), *n.* (١) برسێتی (٢) حەز؛ تاسە بۆ بوون؛ بێزوو.

*v.i.* (١) برسی بوون
(٢) ( ~ for ; ~ after )، بۆ بەتاسەوەبوون؛ بێزوو پێوەکردن؛ حەزلێکردن: *( to ~ for a woman, love, comfort, etc.)*

*v.t.* برسی کردن؛ لە برسا کوشتن.

**hunger strike,** مان گرتن لە نانخواردن؛ مان گرتنی نانخواردن.

**hungry** (huŋ′gri), *adj.* (١) برسی.
(٢) بێزووکەر؛ بەتاسەوە *( a ~ glance)*.
(٣) [Rare] برسیکەر.
(٤) بێ پیت؛ بێ بەر؛ ڕووتەنی؛ ووشك: *( ~ soil)*.

**-hungrily** *(adv.)*; **hungriness** *(n.)*.

**hunk** (huŋk), *n.* [Colloq.], پلێکی گەورە (گۆشت)؛ پارچە نان؛ کلۆ؛ تۆپەڵ

**hunks** (huŋks), *n.* کەسێکی مڕومۆنی ناپەسەندی پیسکە.

**hunt** (hunt), *v.t.* (١) ڕاوکردن (٢) بە شوێندا گەڕان؛ بە دوادا گەڕان؛ بۆ گەڕان (٣) (ا) شوێن کەوتن؛ دواکەوتن. (ب) دواکەوتن و لەکۆڵ نەبوونەوە؛ ڕاوکردن؛ هەراسان کردن (٤) پشکنین بە ووردی (شوێن).
(٥) ڕاوکردن بە ئەسپ و تانجی و سەگ.

*v.i.* (١) ڕاوکردن (٢) بۆ گەڕان؛ گەڕان بە دوادا.

*n.* (١) ڕاو؛ ڕاوکردن (٢) ڕاوکەران؛ تاقمێك ڕاوکەر. (٣) ناوچەی ڕاو.
(٤) پشکنین؛ بۆ گەڕان.

**hunt down,** (١) دواکەوتن و گرتن یا کوشتن: *( to hunt down a criminal)*
(٢) بۆ گەڕان و دۆزینەوە.

**hunt up,** (١) بۆ گەڕان (٢) دۆزینەوە بە بۆ گەڕان.

**hunter** (hun′tẽr), *n.* (١) ڕاوچی؛ ڕاوکەر؛ نێچیرەوان. (٢) سەگ، تانجی، یا ئەسپی ڕاو.

**hunting** (hunt′iŋ), *n.* ڕاو؛ ڕاوکردن؛ ڕاوچێتی.

*adj.* هی ڕاو؛ هی ڕاوکردن

**hunting ground,** شوێنی ڕاو؛ ڕاوگە.

**huntress** (hun′tris), *n.* (١) ڕاوچی ژن؛ ژنە ڕاوچی؛ بانوخودای ڕاوچی (ئەفسانە). (٢) ماینی ڕاو.

**huntsman** (hunts′mən), *n.* [Chiefly British], (١) ڕاوچی؛ ڕاوکەر. (٢) سەردەستەی ڕاوێك یا ڕاوچییان.

**hurdle** (hũr′d'l), *n.* (١) تەیمان. (٢) چوارچێوەی گواستنەوەی تاوانباران بۆ هەڵواسینیان لە ئینگلتەرە لە کۆندا.
(٣) چوارچێوە یا کۆسپی بەسەردا بازددان (ملەملێی ئەسپ یا ڕاکەران).
(٤) *(pl.)* ملەملێی بەسەر کۆسپدا بازدان (ئەسپ، ڕاکەر).
(٥) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ؛ قۆرت؛ بەربەست.

*v.t.* (١) تەیمان کردن؛ پەرژین کردن
(٢) بازدان بەسەر کۆسپ یا چوارچێوەدا (ملەملێ).
(٣) سەرکەوتن بەسەر کەندوکۆسپدا؛ زاڵبوون بەسەر کۆسپ و ناخۆشیدا

**the hurdles,** ملەملێی بازدان بەسەر کۆسپ یا چوارچێوەدا (ئەسپ، ڕاکەر).

**-hurdler** *(n.)*.

**hurdy-gurdy** (hũr′di-gũr′di), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی کۆنباوە.

**hurl** (hũrl), *v.t.* (١) فڕێدان (بەرد، شت)؛ تووڕدان؛ هەڵدان؛ پیادان؛ پیاکێشان: *( They ~ed stones at the police.)*.
(٢) هەڵگەڕانەوە؛ فڕێدانە خوارەوە؛ ڕووخاندن؛ هەڵدان؛ هەڵدانە خوارێ.
(٣) پێ ووتن بە دەنگی بەرزو بە تووڕەیی (جوێن).

*v.i.* (١) پیادان؛ فڕێدان؛ پیاکێشان
(٢) [Archaic]، بە پەلە دەرپەڕین یا ڕۆیشتن.
(٣) [Slang]، تۆپ هەڵدان (یاری بێسبۆڵ).

*n.* فڕێدان؛ تووڕدان؛ هەڵدان؛ پیادان.

**hurly** (hũr′li), *n.* [Archaic], = **hurly-burly.**

**hurly-burly** (hũr′li-bũr′li), *n.* هەراوهوریا؛ هەراوزەنا؛ پشێوی؛ غەڵبەغەڵب.

**hurrah** (hoo-rô′, hə-rä′), *interj. & n.* ئافەرین!؛ ئافەرم!؛ دەست خۆش!.

*v.i. & v.t.* ئافەرین کردن؛ هاندان.

**hurray** (hoo-rā′, hə-rā′), *interj., n., v.t. & v.i.* = **hurrah.**

**hurricane** (hũr′i-kān′), *n.* گەرداو؛ باوبۆران.

**hurricane lamp,** لەمپای گەرداو: کڵۆپێك یا مۆمێکی بە شووشە دەورەگیراو؛ فانۆس.

**hurried** (hũr′id), *adj.* (١) پەلەلێکراو؛ ڕافڕێنراو.
(٢) پەلە؛ بە پەلە کراو: *( a ~ meal, tour, etc.)*.

**hurriedly** (hũr′id-li), *adv.* بە پەلەپڕووزێ؛ بە پەلەپڕووسکێ؛ بە پەلە؛ بە هەڵەداوان؛ بە پەلەفرتێ.

**hurry** (hũr′i), *v.t.* پەلە لێکردن؛ دەستوبرد لێکردن؛ زوو لێکردن؛ خێرالێکردن.

*v.i.* پەلەکردن؛ زووکردن؛ خێراکردن؛ دەستوبردکردن.

*n.* پەلە؛ پەلەکردن؛ دەستوبرد؛ بە خێرا.

**hurry up!,** خێراکە!؛ پەلە کە!؛ زوو کە!؛ دەستوبرد کە!.

**hurry-scurry** (hũr′i-skũr′i), *n.* شپرزەیی؛ پەلەپڕووزکێ؛ پەلەفرتێ.

*v.t.* پەلەپڕووسکێ کردن؛ بە پەلەو شپرزەیی جووڵانەوە؛ پەلەفرتێ بوون.

*adj.* شپرزە؛ پەلە؛ پەلەیەتی.

*adv.* بە شپرزەیی؛ بە شپرزە؛ بە پەلە.

**hurt** (hũrt), *v.t.* (١) بریندارکردن؛ ئازاردان.
(٢) زیان لێدان؛ زیان پێ گەیاندن.
(٣) دڵ ئازاردان؛ دڵ ئێشاندن؛ هەست بریندارکردن.

*v.i.* (١) بریندارکردن؛ ئازاردان؛ بریندازبوون.
(٢) ئێشان؛ ئازاربوون؛ ژان کردن: *( My leg ~s.)*.

*n.* (١) ئازار؛ ئێش؛ برین؛ ئێش و ئازار. (٢) زیان.

(٣) هەست بریندارکەر؛ دڵ ئازاردەر

**hurtful** (hûrt'fəl), *adj.* (١) بە ئازار؛ ئازاردەر (٢) زیانبەخش.

**husband** (huz'bənd), *n.* (١) مێرد؛ هاوسەر

(٢) [Archaic]، سەرکار.

(٣) کەسێکی گیر؛ دەست بە پارەوە گر؛ یا دەست قووچاو.

*v.t.* (١) ژن مارەکردن؛ ژنهێنان؛ بوون بە مێرد.

(٢) دەست بە پارەوە گرتن؛ پارە بەفیڕۆنەدان.

(٣) [Archaic]، دان بە شوو؛ لێ مارەکردن؛ مێرد بۆ دۆزینەوە.

(٤) [Obs.]، کشت کردن؛ ڕووەک بەخێوکردن؛ زەوی چاندن.

**husbandman** (huz'bənd-mən), *n.* [Archaic], کشتیار؛ زانای کشتوکاڵ.

**husbandry** (huz'bənd-ri), *n.* (١) بەڕێوەبردنی کاروباری ناوماڵ.

(٢) دەست بە پارەوە گرتن؛ پارە بەفیڕۆنەدان؛ گیری.

(٣) کشتوکاڵ؛ کشت کردن؛ کشتیاری.

(٤) بەخێوکردن و پەروەردەکردنی هەموو جۆرە گیاندارێکی ماڵی بەشێوەیەکی زانستیانە: ( animal ~ ).

**hush** (hush), *v.t.* (١) بێ دەنگ کردن؛ دەم کوت کردن؛ دەم پێ داخستن.

(٢) هێمن کردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ؛ کوژاندنەوە (ئاژاوە).

(٣) شاردنەوە (دەنگوباس)؛ قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوە؛ داپۆشین.

*v.i.* بێ دەنگ بوون؛ دەم داخستن.

*adj.* [Archaic], بێ دەنگ؛ خامۆش.

*n.* بێ دەنگی؛ خامۆشی.

*interj.* بێ دەنگ بە؛ ووس بە!؛ وس!

hush up, (١) بێ دەنگ کردن؛ دەمکوت کردن.

(٢) شاردنەوەی دەنگوباس؛ پێشێل کردن یا ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی دەنگوباس

**hush-hush** (hush-hush), *adj.* [Colloq.], نهێنی؛ شاراوە

**hush money,** بەرتیلی بێ دەنگ بوون (لە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسێک)؛ بەرتیلی دەمکوت کردن.

**hush puppy,** خواردنێکە لە بەشی خوارووی ئەمەریکا بریتییە لە خڕۆکەیەک گەنمەشامی کوتراوی سوورەوەکراو ئەوەندەی گوێزێک دەبێت.

**husk** (husk), *n.* (١) توێک (دانەوێڵە)؛ کەپەک؛ سۆس؛ توێکی دانەوێڵەو سەوزە (گەڵای گوڵە گەنمەشامی). (٢) توێکڵ؛ قاوغ.

*v.t.* پاک کردن؛ توێکڵ لێکردنەوە.

-husker *(n.)*.

**husky** (hus'ki), *adj.* (١) (ا) توێکڵاوی؛ توێکاوی.

(ب) وەک توێکڵ یا توێک (٢) نووساو (دەنگ)؛ گڕ؛ دەنگ نێر: *( a ~ voice)* .

-huskily *(adv.)*; huskiness *(n.)*.

**husky** (hus'ki), *adj.* چوارشانە؛ کەتە؛ تێکسمراو؛ زل؛ چەتەوول؛ زرتەبۆز

*n.* کەسێکی چوارشانە، کەتە، یا تێکسمراو.

-huskiness *(n.)*.

**husky** (hus'ki), *n.* سەگێکی زل تووک درێژە گالیسکە بەفرینەی پێ ڕادەکێشرێ. هەروەها پێی دەڵێن: " Alaskan husky " وە " Siberian husky ".

**hussy** (huz'i, hus'i), *n.* (١) ئافرەتێکی سووک (لەڕووی سووکی یا گاڵتەوە). (٢) ئافرەتێکی بێ حەیاو چەقاوەسوو.

**hustings** (hus'tiŋz), *n.pl.* (١) (ا) ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە.

(ب) دادگای ناوشاری ئینگلیزی (ج) دووانگەی ناوزەدکردنی نوێنەران بۆ هەڵبژاردنیان بۆ پەرلەمان (٢) هەڵبژاردن (٣) دووانگە.

**hustle** (hus''l), *v.t.* (١) پاڵەپەستۆکردن؛ پاڵ پێوەنان؛ بەزۆر ڕێ بۆ خۆ کردنەوە (٢) زۆرلێکردن؛ پاڵ پێوەنان یا دەرکردن بە پەلەو ناشرینانە: *( He ~d the unwelcome visitors out of the house.)*

(٣) [Colloq.]. پەلەلێکردن؛ بەپەلەکردن.

(٤) [Colloq.]. بۆ گەڕان و دۆزینەوە بە چالاکییانە؛ ڕاکێشان.

*( to ~ new customers)*

*v.i.* (١) پاڵەپەستۆکردن؛ پاڵ نان؛ بەزۆر ڕێ بۆ خۆ کردنەوە.

(٢) هەوڵ و تەقەلا؛ کارکردن یا جووڵانەوە؛ هەوڵ و تەقەلا زۆردان.

*n.* (١) پاڵەپەستۆ؛ پاڵ نان.

(٢) [Colloq.]، کۆشش؛ هەوڵ و تەقەلا؛ چالاکی.

-hustler *(n.)*.

**hut** (hut), *n.* کوختە؛ کوخ؛ خانوچکە.

*v.t.* کوختە بۆ دۆزینەوە؛ کوختە پێدان.

*v.i.* لە کوختەدا ژیان.

**hyacinth** (hī'ə-sinth'), *n.* (١) (ا) یاقووت. (ب) چەند جۆرە بەردێکی بەنرخی سوورکار یا پرتەقاڵییە. (٢) هاس؛ گوڵە هاس.

(٣) باڵندەیەکی ناوی پەڕ ئەرخەوانییە. (٤) ئەرخەوانی شینکار.

**hyacinthine** (hī'ə-sin'thin, hī'ə-sin'thīn), *adj.* (١) یاقووتی؛ وەک هاس؛ بە یاقووت یا هاس ڕازاوە. (٢) شین؛ ئەرخەوانی شینکار.

(٣) پرتەقاڵییەکی سوورکار.

**hybrid** (hī'brid), *adj.* (١) گیاندار یا ڕووەکی دووڕەگ.

(٢) شتێکی نارەسەن؛ شتێکی دووڕەگ یا تێکەڵاو

(٣) ووشەی دوو برگە؛ لە دوو برگە یا ووشەی زمانی جیاجیا پێکهاتووە

*adj.* دووڕەگ؛ تێکەڵاو.

-hybridism *(n.)*.

**hybridize** (hī'bri-dīz'), *v.t. & v.i.* دوو توخم کردن؛ دوو توخم تێکەڵاوکردن؛ دوو توخم لە یەک چاککردن.

-hybridization *(n.)*.

**hydrant** (hī'drənt), *n.* بۆری یا بەلوعەی ئاگرکوژێن: بریتییە لە بۆرییەکی گەورەی ستوونی لەسەر شەقامەکاندا بەستراوە بە سەرچاوەی ئاوەوە بۆری لاستیکی ئەستووری پێوە دەبەسترێ و ئاگری پێ دەکوژێنرێتەوە (هەروەها پێی دەوترێ: " fire hydrant ").

**hydrate** (hī'drāt), *n.* ئاوێتەی ئاو و ماددەیەکی تر.

*v.t.* ئاو تێکەڵاوکردن؛ لەگەڵ ئاودا تێکەڵاوکردن.

*v.i.* لەگەڵ ئاودا تێکەڵاوبوون.

-hydrated *(adj.)*; hydration *(n.)*.

**hydraulic** (hī-drô'lik), *adj.* هایدرۆلیکی: (ا) بە ئاو دەگەڕێ (مەکینە). (ب) ڕەق بوون لەگەڵ ئاودا (چیمەنتۆ، تووروقسل).

(ج) تایبەتی بە زانستی شلەو سرووشتی و بەکارهێنانی لە ئەندازەدا.

**hydraulics** (hī-drô'liks), *n.* زانستی شلەو بەکارهێنانی لە ئەندازەدا.

**hydric** (hī'drik), *adj.* (١) تایبەتی بە هایدرۆجین.

(٢) تایبەتی بە تەڕی یا شێ؛ تەڕ؛ ئاو زۆر ویست.

**hydro-** (hī'drō, hī'drə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) ئاو.

(ب) هایدرۆجین دار؛ هایدرۆجینی تێدایە.

**hydrocephalus** (hī'drə-sef'ə-ləs), *n.* نەخۆشییەکی زگماکییە بریتییە لە زۆری شلە لە سەردا کە دەبێتەهۆی گەورە بوونی کاسەی سەرو بچووک بوونەوەی مێشک.

**hydrocephaly** (hī'drə-sef'ə-li), *n.* – **hydrocephalus.**

**hydroelectric** (hī'drō-i-lek'trik), *adj.* تایبەتی بە ئەلەکتریکی لە ئاو دروستکراو.

**hydroelectricity** (hī'drō-i-lek'tris'ə-ti), *n.* ئەلەکتریکی ئاو؛ ئەلەکتریکی لە ئاو دروستکراو.

**hydrogen** (hī'drə-jən), *n.* هایدرۆجین.

**hydrogenate** (hī'drə-jə-nāt'), *v.t.* هایدرۆجین تێکردن؛ هایدرۆجین تێکەڵاوکردن.

-hydrogenation *(n.)*.

**hydrogen bomb,** بۆمبای هایدرۆجینی.

**hydrogenize** (hī'drə-jə-nīz'), *v.t.* = **hydrogenate.**

**hydrogenous** (hī-droj'ə-nəs), *adj.* هایدرۆجیناوی؛

هایدرۆجینی تێدایە.

**hydrography** (hi-drog′rə-fi), ***n.*** زانستی لێکۆڵینەوەو نەخشە بۆ دروستکردنی دەریاو دەریاچەو ڕووبار (بەتایبەتی دەربارەی سوودی بازرگانی و دەریاوانی).

**-hydrographer** ***(n.)***; **hydrographic** ***(adj.)***.

**hydrokinetics** (hī′drō-ki-net′iks), ***n.pl.*** زانستی بزووتنی شلە (فیزیا).

**-hydrokinetic** ***(adj.)***.

**hydrology** (hī-drol′ə-ji), ***n.*** زانستی ئاو و تایبەخۆکانی و دابەشبوونی بەسەر زەوی و ژێرزەویدا بەتایبەتی ژێرزەوی

**-hydrologic** ***(adj.)***; **hydrologist** ***(n.)***.

**hydromechanics** (hī′drō-mi-kan′iks), ***n.pl.*** زانستی بزووتن و هاوسەنگی شلە (فیزیا).

**hydromel** (hī′drə-mel′), ***n.*** ئاو و هەنگوینی تێکەڵاو (خواردنەوە).

**hydrometallurgy** (hī′drə-met′'l-ūr′ji), ***n.*** پاک و پوخت کردنی کانزای خاو بە شۆردنەوەی بە شلە.

**hydrometer** (hī-drom′ə-tēr), ***n.*** پێوەری هێزی موگناتیسی شلە (ئامێر).

**hydrometry** (hī-drom′ə-tri), ***n.*** پێوانی هێزی موگناتیسی شلە

**hydropathy** (hi-drop′ə-thi), ***n.*** دەرمان کردن و چارەکردنی نەخۆشی بە ئاو.

**hydrophobia** (hī′drə-fō′bi-ə), ***n.*** (١) ترسی ئاو؛ لە ئاو ترسان؛ لە ئاو تۆقین (٢) نەخۆشی هاری (بەتایبەتی لە پیاودا).

**-hydrophobic** ***(adj.)***.

**hydroplane** (hī′drə-plān′), ***n.*** (١) بەلەمێکی بۆ تەختی خێرا (٢) فڕۆکەی ئاوی. (٣) ئەو بەشەی فڕۆکەی ئاوی کە بەهۆیەوە فڕۆکەکە لەسەر ئاو دەخلیسکێ. (٤) ستێرنی بەرزکردنەوەو نزم کردنەوەی ژێردەریایی.

***v.i.*** (١) لێخوڕین یا سواربوونی فڕۆکەی ئاوی یا بەلەمێکی خێرا. (٢) خلیسکان (وەک فڕۆکەی ئاوی).

**hydroponics** (hī′drə-pon′iks), ***n.pl.*** پەروەردەکردنی ڕووەک لە ئاوێکدا کە پەینی کیمیایی تێدا بێت لە باتی خاک

**hydrothermal** (hī′drə-thūr′məl), ***adj.*** (١) هی ئاوی گەرم (٢) تایبەتی بە ئاوی گەرمو کارکردنییە سەر کانزای چینی سەر ڕووی زەوی.

**hydrothorax** (hī′drə-thôr′aks), ***n.*** ئاوبەنگی سنگ.

**hydrous** (hī′drəs), ***adj.*** (١) ئاواوی؛ ئاوی تێدایە؛ ئاودار؛ تەڕ (٢) ئاوی تێدایە (ئاوێتەی کیمیایی).

**hyena** (hī-ē′nə), ***n.*** کەمتیار

**hygiene** (hī′jēn, hī′ji-ēn′), ***n.*** زانستی تەندروستی و پەرەپێدان و بەردەوام بوونی؛ پاک وتەمیزی

**hygienic** (hī′ji-en′ik, hī-jē′nik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە تەندروستی و پاک وتەمیزی. (٢) بۆ تەندروستی باش. (٣) پاک وتەمیز

**-hygienical** ***(adj.)***; **hygienically** ***(adv.)***.

**hygienics** (hī′ji-en′iks, hī-jē′niks), ***n.*** = **hygiene.**

**hygienist** (hī′ji-ən-ist), ***n.*** تەندروستی زان؛ شارەزای تەندروستی

**hymen** (hī′mən), ***n.*** پەردەی کچ؛ بنی کچ

**hymeneal** (hī′mə-nē′əl), ***adj.*** تایبەت بە شایی و ژنهێنان و شووکردن

***n.*** گۆرانی شایی؛ هەڵبەستی شایی؛ بەستەی شایی

**hymn** (him), ***n.*** (١) سرووی ئاینی؛ سرووودی خودایی (٢) سرووی شکۆپێدان و مەزن کردن

***v.t. & v.i.*** سروود ووتن؛ شکۆپێدان و مەزن کردن لە سروودا.

**hymnal** (him′nəl), ***n.*** = **hymnbook.**

***adj.*** تایبەتی بە سروود (ئاینی و نائاینی)

**hymnbook** (him′book′), ***n.*** سروودنامە؛ نامیلکە یا پەرتووکی سروود.

**hymnody** (him′nə-di), ***n.*** (١) سروود ووتن؛ سروود خوێندنەوە. (٢) لێکۆڵینەوەی سروودو مێژوو و بەکارهێنانی. (٣) سروود

**hymnology** (him-nol′ə-ji), ***n.*** (١) لێکۆڵینەوەی سروود. (٢) سروود. (٣) دانانی سروود.

**-hymnologist** ***(n.)***.

**hyper-** (hī′pēr), پێشگرێکە بەمانای: زۆر؛ زیاد لە ئەندازە؛ نێچگار.

**hyperacid** (hī′pēr-as′id), ***adj.*** زۆر ترش.

**-hyperacidity** ***(n.)***.

**hyperactive** (hī′pēr-ak′tiv), ***adj.*** بزێو؛ نەسرەوت؛ بێ ئارام؛ زۆر جموجووڵکەر.

**-hyperactivity** ***(n.)***.

**hyperbole** (hī-pūr′bə-li), ***n.*** زیادەڕۆیی (دووان، نووسین)؛ زیادەپێوەنان (وەک لەم دوو ڕستەیەدا پیشاندراوە):

***( I could sleep for a year.; This book weighs a ton.)***

**-hyperbolic** ***(adj.)***; **hyperbolically** ***(adv.)***.

**hyperbolism** (hī-pūr′bə-liz′m), ***n.*** (١) زیادەڕۆیی (دووان؛ نووسین)؛ زیادەپێوەنان (٢) وێنەیەکی زیادەڕۆیی.

**hyperbolize** (hī-pūr′bə-līz′), ***v.t. & v.i.*** زیادە ڕۆیشتن لە دووان و نووسیندا؛ زیادە پێوەنان.

**hypercatalexis** (hī′pēr-kat′ə-lek′sis), ***n.*** بڕگەیەک یا دوانی زیادە لە کۆتایی دێڕێکی هۆنراوەدا.

**-hypercatalectic** ***(adj.)***.

**hypercritic** (hī′pēr-krit′ik), ***n.*** کەسێکی زۆر بەرەخنە؛ کەسێکی نێچگار زۆر ڕەخنەگر.

**hypercritical** (hī′pēr-krit′i-k'l), ***adj.*** زۆر بەرەخنە؛ زۆر ڕەخنەگر.

**hyperemia** (hī′pēr-ē′mi-ə), ***n.*** خوێن تێزان.

**-hyperemic** ***(adj.)***.

**hyperesthesia** (hī′pēr-es-thē′zhə), ***n.*** هەستیاری یا ناسکی پێست و ئەندامی هەست.

**Hyperion** (hī-pêr′i-ən), ***n.*** خودای خۆر (ئەفسانەی یۆنانی).

**hyperkinesia** (hī′pēr-ki-nē′zi-ə), ***n.*** زۆر بزوان یا لەرزینی ئەندامێکی لەش بەتایبەتی ماسولکە (نەخۆشی).

**hypermetropia** (hī′pēr-mi-trō′pi-ə), ***n.*** دووربینی (نەخۆشی چاو)

**hyperopia** (hī′pēr-ō′pi-ə), ***n.*** = **hypermetropia.**

**hyperpyrexia** (hī′pēr-pī-rek′si-ə), ***n.*** تایەکی زۆر بەرز.

**hypersensitive** (hī′pēr-sen′sə-tiv), ***adj.*** هەست ناسک؛ هەست زۆر ناسک؛ هەستیار

**-hypersensitivity** ***(n.)***.

**hypertension** (hī′pēr-ten′shən), ***n.*** (١) نەسرەوتن؛ جرت وفرت (٢) تەوژمی خوێن بەرزی یا زۆری

**hyphen** (hī′f'n), ***n.*** تەقەڵ (ڕێزمان)؛ تەقەڵی ووشەی لێکدراو.

**hyphenate** (hī′f'n-āt′), ***v.t.*** لێکدانی دوو ووشە بە تەقەڵ.

***adj.*** ووشەی بە تەقەڵ لێکدراو.

**-hyphenated** ***(adj.)***; **hyphenation** ***(n.)***.

**hypno-** (hip′nō, hip′nə), ***Also*** **hypn-**, پێشگرێکە بەمانای: خەوتن؛ نوستن. (٢) نوواندنی موگناتیسی؛ نوستنی موگناتیسی؛ خەوتنی موگناتیسی.

**hypnology** (hip-nol′ə-ji), ***n.*** زانستی نوستن و نوستنی موگناتیسی.

**hypnosis** (hip-nō′sis), ***n.*** (١) نوواندنی موگناتیسی (٢) نوستنی موگناتیسی؛ خەوتنی موگناتیسی.

**hypnotherapy** (hip′nō-ther′ə-pi), ***n.*** چارەکردنی نەخۆشی بە نوواندنی موگناتیسی

**hypnotic** (hip-not′ik), ***adj.*** (١) خەولێخەر ***( ~ music)*** .
(٢) تایبەتی بە خەولێخستنی موگناتیسی.
(٣) بە ئاسانی خەوی لێ دەخرێت یا دەنوێنرێت.
(٤) خەولێخراو؛ نوێنراو.
***n.*** (١) دەرمانی خەولێخەر. (٢) (ا) شتێکی خەولێخراو.
(ب) کەسێکی بە ئاسانی خەولێخراو.
**-hypnotically** ***(adv.).***
**hypnotism** (hip′nə-tiz'm), ***n.*** (١) خەولێخستنی موگناتیسی؛ نوواندنی موگناتیسی (٢) زانستی خەولێخستنی موگناتیسی.
**hypnotist** (hip′nə-tist), ***n.*** خەولێخەری موگناتیسی (مرۆڤ)
**hypnotize** (hip′nə-tīz′), ***v.t.*** (١) خەولێخستنی موگناتیسی؛ نوواندنی موگناتیسی (٢) [Colloq.]، بێ هۆش کردن؛ دڵفڕاندن؛ وورکردن؛ سڕکردن؛ لە هۆش خستن:
***( He ~d the audience with his eloquent speech.)***
**hypo** (hī′pō), ***n.*** (١) دەرزی یا شرینقەیەکە کە لەژێر پێست دەدرێت.
(٢) [Slang] **hypochondriac** .
**hypo-** (hī′pō, hip′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) لەژێر
(٢) کەمتر کەمتر لە
(٣) زۆر ژەنگ ناگرێ.
**hypochondria** (hī′pə-kon′dri-ə, hip′ə-kon′dri-ə), ***n.*** زۆر مەراقی تەندروستی خواردن و هەمیشە خۆ بە نەخۆش دانان و سکاڵاکردن.
**hypochondriac** (hī′pə-kon′dri-ak′), ***n.*** کەسێکە کە زۆر مەراقی تەندروستی بخوات و هەمیشە خۆی بە نەخۆش بزانێ و سکاڵای بێ.
***adj.*** تایبەتی بە کەسێکی وەها.
**hypochondriasis** (hī′pə-kən-drī′ə-sis), ***n.***
**hypochondria.**
**hypochondrium** (hī′pə-kon′dri-əm), ***n.*** لاخوارووی کەلەکە لەخوار پەراسووەوە؛ لاتەڕاف.
**hypocrisy** (hi-pok′rə-si), ***n.*** دووڕوویی؛ بێ باری؛ دووزبانی؛ منافەقیتی
**hypocrite** (hip′ə-krit), ***n.*** کەسێکی دووڕوو، بێ بار، دووزبان، یا منافەق.
**hypocritical** (hip′ə-krit′i-k'l), ***adj.*** دووڕوو؛ بێ بار؛ دووزبان؛ منافەق ***( It is ~ of him to say that.; You are being ~ . )*** .
**hypoderma** (hī′pə-dūr′mə), ***n.*** چینی ژێر پێست؛ شانەی ژێر پێست
**-hypodermal** ***(adj.).***
**hypodermic** (hī′pə-dūr′mik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە ژێر پێست.
(٢) لە ژێر پێست دەدرێت (دەرزی، شرینقە).
***n.*** شرینقە یـ دەرزی لە ژێر پێست دراو.
**-hypodermically** ***(adv.).***
**hypodermic injection,** دەرزی لێدانی ژێر پێست؛ شرینقەلێدانی ژێر پێست
**hypodermic needle,** دەرزی شرینقەلێدان لە ژێر پێست.
**hypodermic syringe,** سرنج یا شرینقەی لە ژێر پێست دراو.
**hypodermis** (hī′pə-dūr′mis), ***n.*** چینی ژێر پێست (گیاندار، ڕووەک)؛
**hypogastrium** (hī′pə-gas′tri-əm), ***n.*** لای خوارووی سک (لە ناوکەوە بۆ تووکەبەر).
**-hypogastric** ***(adj.).***
**hypoglycemia** (hī′pō-glī-sē′mi-ə), ***n.*** شەکر کەمی لە خوێندا (نەخۆشی
**hypothec** (hī-poth′ik), ***n.*** مافی خاوەن قەرزێک بە وەرگرتنی سامان و زەوی و زاری قەرزارەکە بە بارمتە
**hypothecate** (hī-poth′ə-kāt′), ***v.t.*** بارمتەکردنی سامان و زەوی و زاری قەرزار
**hypothermal** (hī′pə-thūr′m'l), ***adj.*** (١) شلەتێن.
(٢) تایبەتی بە نزمی پلەی گەرمای لەش.
**hypothermia** (hī′pə-thūr′mi-ə), ***n.*** نزمی پلەی گەرمای لەش بەهۆی سەرمایەکی زۆرەوە (پزیشکەوانی).
**hypothesis** (hī-poth′ə-sis, hi-poth′ə-sis), ***n.*** گریمانەکی؛ گریمانە؛ وا دانان.
**hypothesize** (hī-poth′ə-sīz′), ***v.i. & v.t.*** گریمان؛ وا دانان؛ گریمانەکی کردن.
**hypothetical** (hī′pə-thet′i-k'l), ***adj.*** گریمانەکی؛ وا دانراو: ***( a ~ situation)***
**-hypothetic** ***(adj.)***; **hypothetically** ***(adv.).***
**hyster-, hystero-** (his′tēr), پێشگرێکە بەمانای: (١) مناڵدان ***( hysteroctomy)***
(٢) هیستیریا؛ حاڵ لێهاتن؛ شێتگیری.
**hysterectomy** (his′tēr-ek′tə-mi), ***n.*** لابردن یا دەرهێنانی منداڵدان (پزیشکەوانی)
**hysteria** (his-têr′i-ə, his-ter′i-ə), ***n.*** هیستیریا؛ حاڵ لێهاتن؛ شێتگیری؛ شێتگیربوون؛ فێ لێهاتن (مەجازی)؛ پێکەنین یا گریان یا هەڵچوونێکی لە ئەندازە بەدەر و خۆ بۆ نەگیران.
**hysterical** (his-ter′i-k'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە هیستیریا.
(٢) هیستیریای هەیە؛ تووشی هیستیریا بووە؛ شێتگیر؛ هەڵچووە.
(٣) زووهەڵچوو؛ زوو هەڵدەچێ؛ زوو شێتگیر دەبێ.
**hysterics** (his-ter′iks), ***n.pl.*** (١) پێکەنین یا گریانێکی زۆر و خۆ بۆ نەگیران (٢) هیستیریا تووش بوون؛ شێتگیربوونێک.
**hysterotomy** (his′tə-rot′ə-mi), ***n.*** بڕینی منداڵدان بۆ منداڵ لێ دەرهێنان؛ نەشتەرگەری قەیسەری (منداڵ بوون).

# I i

**I, i** (ī), *n.* (١) تیپی نۆهەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزی‌یە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە " ئای ". (٣) نیشانەی نۆهەم لە ریزێکدا.
*adj.* (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) نۆهەم؛ نۆهەمین.
**I** (ī), *n.* (١) شتێك كە شێوەی لەم تیپە بچێت.
(٢) ژمارە یەك یا یەكەم لە لاتینیدا.
(٣) نمرەی " ناتەواو **Incomplete** "، واتە قوتابی لەو وانە یا كۆرسەدا دەرنەچوودو دەبێت تاقی بكرێتەوە.
**I** (ī), *pron.* من؛ بەندە
*n.* (١) من . *( He uses too many ~'s in writing )*.
(٢) خود؛ گیان؛ من
**iamb** (ī'amb), *n.* بەشی دێرێكی هۆنراوەیە كە لە دوو برگە پێكهاتووە یەكەمیان بێ هێزو دووەمیان هێزدارە:
*( Tŏ strive, / tŏ seék, / tŏ find, / and nót, / tŏ yield.)*
**iambic** (ī-am'bik), *adj.* لە برگەی بێ هێزو هێزدار پێكهاتووە (هۆنراوە).
*n.* (١) بەشی دێرێكی هۆنراوەیە كە لە دوو برگە پێكهاتووە یەكەمیان بێ هێزو دووەمیان هێزدارە. (٢) هەڵبەستێك كە بەم جۆرە هۆنرابێتەوە.
(٣) هەڵبەستێكی لاقرتێی ئەم جۆرە.
**ibex** (ī'beks), *n.* بزنەكێوی؛ كەڵەكێوی؛ فیلە گێژە.
**ibidem** (i-bī'dem), *adv.* لە هەمان شوێندا (پەراوێزی پەرتووك، نامیلكە، یا ووتار)؛ هەمان سەرچاوە.
**ibis** (ī'bis), *n.* باڵندەیەكی ترۆپیكی ناوی دەنووك داسی‌یە لە توخمی شاهۆیە.
**-ic** (ik), پاشگرێكە بەمانای: (١) تایبەتی بە؛ هی: *( volcanic)* .
(٢) وەك *( angelic)*.
(٣) لێ پێكهاتوو؛ لێ پەیدابوو؛ تیایەتی: *( alcoholic)*.
**-ical** (i-k'l), پاشگرێكە بەمانای: وەها؛ وەهایی؛ تایبەتی بە:
*( physical, historical, commercial)*
**Icarus** (ik'ə-rəs, ī'kə-rəs), *n.* ئیكارۆس لەگەڵ " دیدالۆس " ی باوكیدا لە بەندیخانە ڕای كرد بە باڵی مۆمەوە بەڵام زۆر بەرزەفڕیی و گەرمی خۆر باڵە مۆمەكانی تواندەوەو كەوتە خوارەوەو لە دەریادا نوقم بوو.
-Icarian *(adj.)*.
**ice** (īs), *n.* (١) سەهۆڵ؛ زوقم. (٢) تەبەقە سەهۆڵ؛ پارچە سەهۆڵ.
(٣) زوقم. (٤) كرێمی سەر كێك. (٥) [Slang]، ئەڵماس.
*v.t.* (١) بەستن كردن بە سەهۆڵ. (٢) بە سەهۆڵ داپۆشین؛ سەهۆڵ لێدان.
(٣) ساردكردنەوە بە سەهۆڵ. (٤) كرێم خستنە سەر كێك.
*v.i.* ( ~ up ; ~ over), بەستن؛ بوون بە سەهۆڵ.
break the ice, شەرم شكان؛ ڕووكرانەوە.
cut no ice, [Colloq.], بێ كەڵك؛ بێ دەسەڵات؛ كارناكاتە سەر هیچ.
on thin ice, [Colloq.], شلۆق؛ پڕ لە مەترسی.
**ice age,** چەرخی بەستەڵەك؛ چەرخی سەهۆڵ.
**ice bag,** كیسە سەهۆڵ
**iceberg** (ıs'bũrg'), *n.* شاخی سەهۆڵ (بەتایبەتی كە سەر ئاوی دەریا كەوتبێ)؛ بەستەڵەك.
**iceboat** (īs'bōt'), *n.* (١) بەلەمی سەر سەهۆڵ
(٢) **icebreaker**.
**ice-bound** (īs'bound'), *adj.* (١) بە سەهۆڵ دەورەدراو؛ لە سەهۆڵدا چەقیو (بەلەم). (٢) بە سەهۆڵ گیراوەو كەس نایگاتێ (جێگە).
**icebox** (īs'boks'), *n.* (١) سەهۆڵدان؛ بەفردان؛ یەخچاڵ.
(٢) سنوقێكی كۆنبڕە سەهۆڵی تێ دەخرێ بۆ خواردەمەنی ڕاگرتن بە ساردی.
**ice-breaker** (īs'brāk'ẽr), *n.* (١) سەهۆڵ شكێن (بەلەم)
(٢) چوارچێوەی پاراستنی ئەسكەلە لە سەهۆڵی سەرئاوكەوتوو.
**ice cap,** كڵاوەقوتەی سەهۆڵبەندانی شاخ.
**ice cream,** دۆندرمە
**iced** (ıst), *adj.* (١) بە سەهۆڵ داپۆشراو؛ سەهۆڵاوی.
(٢) بە سەهۆڵ ساردكراو؛ سارد.
(٣) كرێم بەسەر (كێك).
**ice field, ice floe,** تەبەقێكی گەورە سەهۆڵی سەرئاوكەوتووی دەریا.
**ice-hockey,** یاری "هۆكی" (كە لەسەر سەهۆڵ دەكرێت).
**ice-house** (īs'hous'), *n.* (١) یەخچاڵ.
(٢) سەهۆڵگە؛ جێی دروستكردنی سەهۆڵی دەستكرد.
**Icelandic** (īs-lan'dik), *adj.* تایبەتی بە وڵاتی ئایسلانداو میللەتەكەی‌و زمانەكەی‌و كلتوورەكەی.
*n.* زمانی ئایسلاندی.
**iceman** (īs'man', īs'mən), *n.* بەفرفرۆش؛ سەهۆڵ فرۆش.
**ice pack,** (١) كۆمەڵێك سەهۆڵی سەرئاوكەوتوو (كە لە چەند پارچەیەك سەهۆڵی پێكەوە نووساو پێكهاتووە). (٢) كیسە سەهۆڵ (كە دەخرێتە سەر ئەندامی ئازاراوی لەش بۆ ئەوەی نەئاوسێ).
**ice plant,** ڕووەكێكی هەمیشە سەوزی تەڕزفڕێدەرە بەسەر زەویدا گوڵی سپی‌و ئەرخەوانی دەگرێ، گەڵاكانی گۆشتن‌و باریك‌و چڕن لە دەوروپشتی ماڵدا دەڕوێنرێت بۆ جوانی‌و ئاگربڕ.
**ice water,** بەفراو؛ سارداو (بۆ خواردنەوە)؛ سەهۆڵاو.
**icicle** (ī'si-k'l), *n.* چلوورە؛ كێركەڵەگا.
**icily** (ı'sə-li), *adv.* زۆر بە ساردی؛ سەهۆڵانە
**iciness** (ī'si-nis), *n.* زۆر ساردی؛ ساردی؛ سەهۆڵی
**icing** (īs'iŋ), *n.* كرێمی سەر كێك.
**icon** (ı'kon), *n.* (١) وێنە؛ پەیكەر.
(٢) وێنە یا پەیكەری عیسا، مریەم، یا پیاوێكی ئاینی مەزن (گەلێك جار لەسەر شووشە دەكرێت یا لە شووشە دەگیرێت)؛ ئەیقوون.
**iconic** (ı-kon'ik), *adj.* (١) تایبەتی بە وێنەو پەیكەری عیساو مریەم؛ ئەیقوونی. (٢) تایبەتی بە شێوازێكی تایبەتی‌و كۆنباوی پەیكەرگەری
**iconoclasm** (ī-kon'ə-klaz'm), *n.* (١) بت شكاندن؛ پەیكەر شكاندن (بەتایبەتی هی پیاوی ئاینی). (٢) هێرش بردنە سەرو گاڵتەپێكردن‌و بێ بایەخ كردنی بیروباوەڕی كۆنی كۆمەڵ‌و دەزگاكانی
**iconoclast** (ī-kon'ə-klast'), *n.* (١) بت شكێن؛ پەیكەرو وێنەی ئاینی شكێن‌و دژ بە پەرستنیان. (٢) هێرش بەرە سەرو گاڵتەپێكەرو بە هیچ نەزانینی بیروباوەڕی كۆنی كۆمەڵ‌و دەزگاكانی.
-iconoclastic *(adj.)*.
**iconography** (ī'kə-nog'rə-fi), *n.* (١) هونەری دروستكردنی وێنەو پەیكەری ئاینی. (٢) لێكۆڵینەوەی ئەم هونەرە.

-iconographic *(adj.)*.

**iconology** (ī´kə-nol′ə-ji), *n.* (١) لێکۆڵینەوەی ئەیقوون، واتە وێنەو پەیکەری ئایینی (٢) ئەیقوون؛ سەرجەمی وێنەو پەیکەری ئایینی (٣) ئیشتانەکاری؛ هونەری نیشانەیی.

**icy** (ī′si), *adj.* (١) سەهۆڵاوی؛ بەفراوی؛ بە سەهۆڵ گیراو (٢) سەهۆڵی؛ تایبەتی بە سەهۆڵ. (٣) خز، وەك سەهۆڵ؛ خلیسك. (٤) زۆر سارد؛ زۆر سەرما؛ زوقماوی: *( ~ weather)* . (٥) سارد، هەست)؛ دوورەپەرێز؛ ڕووناخۆش: *( an ~ smile, face, etc.)* .

**id** (id), *n.* بەشی پوختە نەکراوو حەز لە دابڕێ نە کردووی هەستو دەروونی مرۆڤ کە سەرچاوەی هەستی زگماکی‌یە وەك هەوەسی جووت بوونو تێرکردنی کوتوپڕی هەموو حەزو پێویستی‌یەکی مرۆڤ (دەروونناسی)

**I'd** (īd), = 1. I had. 2. I would. 3. I should.

**idea** (ī-dē′ə), *n.* (١) بیر (٢) بیروباوەڕ؛ بیروبڕوا. (٣) ڕا؛ بۆچوون (٤) نەخشە؛ پیلان؛ پرۆژە؛ نیاز (٥) بیرێکی لێڵ؛ ئاگا (٦) نموونەی بنەچەیی، ڕەسەنی، یا ڕاستەقینەی شت کە بریتی‌یە لە بیری ئەو شتەو مرۆڤ تەنها وێنەی ناتەواوو لاسایی دەبینێ بە چاو (فەلسەفەی ئەفلاتونی)

**ideal** (ī-dē′əl), *adj.* (١) نموونەیی؛ تەنها لە مێشك یا بیردا هەیە؛ لە بیر پێکهاتووە (ژمارەی شەشی ووشەی پێشوو ببینە). (٢) ئایاب؛ باشترین؛ زۆرباش؛ نموونەیی: *( an ~ place, job, situation, time, etc.)* (٣) تایبەتی بە بیر (٤) دوور لە ڕاستی‌یەوە؛ خەیاڵی.

*n.* (١) نموونە (٢) ئاوات؛ ئاواتێکی نموونەیی کە مرۆڤ هەوڵی بۆ بداتو پێی بگات: *( an ~ to strive for)*. (٣) شتێك کە تەنها لە مێشکدا هەیەو بوونی تری نی‌یە.

**idealism** (ī-dē′əl-iz′m), *n.* (١) خەیاڵ پەرستی؛ نموونەپەرستی؛ خەیاڵ بڵاوی؛ خەیاڵ خاوی. (٢) کۆشش کردن بۆ گەیشتن بە ئاواتی بەرزی خۆ (٣) خەیاڵ پەرستی لە هونەرو وێژەدا. (٤) فەلسەفەیەکە دەڵێت: کە ئەو شتانەی مرۆڤ بە چاو دەیبینێت وێنەی لاسایی بیروباوەڕی ناو مێشکەو ئەو شتانەش دروستکراوی مێشکن‌و ڕاستی تەنها لە مێشکدایە

**idealist** (ī-dē′əl-ist), *n.* (١) کەسێکی خەیاڵ پەرست؛ نموونە خواز، نموونە پەرست، یا خەیاڵ خاو (هەندێ جار لەڕووی سووکی‌یەوە). (٢) پەیڕەویکەری فەلسەفەی نموونەخوازی لە هونەرو فەلسەفەدا

**idealistic** (ī´dē-ə-lis′tik, ī-dē´ə-lis′tik), *adj.* نموونەپەرست؛ خەیاڵ پەرست؛ خەیاڵ خاو؛ نموونەخواز *( an ~ person)* .

**idealize** (ī-dē′ə-līz´), *v.t.* شکۆپێدان؛ پەرستن؛ بە نموونەی باشی دانان: *( to ~ the past)*

*v.i.* بوون بە نموونە؛ بوون بە باشترین وێنە

-idealization *(n.)*.

**ideally** (ī-dē′əl-i), *adv.* (١) زۆر بە باشی؛ بە شێوەیەکی نموونەیی؛ بە جۆرێکی نموونەیی؛ نموونەیی‌یانە. (٢) ئەگەر چۆن بویسترێ وەها بێ؛ لەڕووی تیۆری‌یەوە؛ ئەگەر بە ئاوتەخوازی بێ.

**ideate** (ī-dē′āt), *v.t. & v.i.* بیر پێکهێنان؛ هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بیر هەبوون دەربارە

*n.* شتێکی دیاردە کە وێنەی بیری ناو مێشك بێ (فەلسەفە)

-ideation *(n.)*; ideational *(adj.)*.

**identical** (ī-den′ti-k'l), *adj.* (١) هەمان شت (٢) دەقاودەق؛ کتومت؛ وەك یەك؛ چوونیەك؛ هاوبابەت؛ لەیەکچوو (٣) لە یەك هێلکەوە بوون (ژیوارناسی)

**identical twins,** دوانەی دەقاودەق؛ هاوزا یا هاوسکی دەقاودەق، واتە هەمان توخم‌و هەمان ڕوخسارو لە هەمان هێلکەوە بوو.

**identifiable** (ī-den′tə-fī´ə-b'l), *adj.* دیاریکراو؛ دەتوانرێ پەنجەی بخرێتە سەر؛ ناسراو.

**identification** (ī-den´tə-fi-kā′shən), *n.* (١) دیاری کردن؛ ناسین؛ ناسینەوە؛ پەنجە خستنەسەر؛ هەڵهێنان. (٢) ناسنامە؛ دیارنامە؛ پێناس: *( Do you have any ~ ?; He used his driver's license as ~ . )* (٣) پەیوەندی‌یەکی گیانی لەگەڵ مرۆڤی تردا‌و هاوسۆزی کردن لە گەڵیاندا: *( His ~ with the poor is remarkable.)*

**identify** (ī-den′tə-fī´), *v.t.* (١) وەك یەك لێکردن؛ کردن بە یەك. (٢) ناسینەوە؛ پەنجە خستنەسەر؛ هەڵهێنان؛ ناسین: *( He ~ied the criminal.)* (٣) دیاری کردن؛ نیشانەکردن؛ ناونووس کردن *( to ~ the problem)* (٤) پشتگیری کردن؛ هاوسۆزی کردن: *( He ~ies with the labor movement.)* (٥) هاوسۆزی کردن بە ئەندازەی خۆ بەو کەسە زانین: *( to ~ with another person)*

**identity** (ī-den′tə-ti), *n.* (١) لەیەکچوون؛ هاوتوخمی؛ دەقاودەقی؛ وەك یەکی. (٢) ناوو ناونیشان؛ ڕاستی کەسێك؛ ئێستاو ڕابوردووی کەسێك. *( He concealed his ~ in order to protect himself.)* (٣) ناسنامە؛ پێناس.

**ideo-** (id′i-ə, ī′di-ə), پێشگرێکە بەمانای: بیر.

**ideogram** (id′i-ə-gram´, ī′di-ə-gram´), *n.* (١) نیشانە؛ نیشانەی بیرێك یا شتێك (وەك تیپ یا وێنەی زمانی چینی). (٢) وێنەی نیشانەیی: ( $, =, #, %, &, * ) .

**ideograph** (id′i-ə-graf´, ī′di-ə-gräf´), *n.* = **ideogram.**

**ideography** (id´i-og′rə-fi, ī´di-og′rə-fi), *n.* (١) بەکارهێنانی نیشانە یا وێنە بۆ دەربڕینی بیرێك یا شتێك. (٢) دەربڕینی بیر یا شت بە نیشانەو وێنە.

**ideological** (ī´di-ə-loj′i-k'l), *adj.* ئەیدیۆلۆجی؛ بیروباوەڕی.

**ideologist** (ī´di-ol′ə-jist), *n.* (١) زانای ئەیدیۆلۆجی یا بیروباوەڕ؛ پسپۆڕی ئەیدیۆلۆجی. (٢) خاوەن بیر یا تیۆری؛ خەیاڵ پەرست. (٣) بیروباوەڕ پەرست؛ شوێن کەوتووی ئەیدیۆلۆجی‌یەکی تایبەتی.

**ideology** (ī´di-ol′ə-ji, id´i-ol′ə-ji), *n.* (١) لێکۆڵینەوەی بیروباوەڕو سەرچاوەی (٢) ئەیدیۆلۆجی؛ بیروباوەڕ؛ بیروباوەڕو شێوەی بیرکردنەوەی مرۆڤ، چین، یا حیزبێك.

**ides** (īdz), *n.pl.* ڕۆژی پانزەی مانگی ئەورۆز، مایس، تەمموزو ئۆکتۆبەرو ڕۆژی سیانزەی مانگەکانی تر لە ڕۆژنامەی ڕۆمانیدا.

**id est** (id est), = **that is.** واتە

**idio-** (id′i-ō, id′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: هی خۆ؛ هی کەسی؛ جیا.

**idiocy** (id′i-ə-si), *n.* (١) بێ مێشکی؛ کەرێتی؛ بێ مێشکێتی. (٢) کار، کردەوە، یا تێبینی‌یەکی کەرانەو بێ مێشکانە.

**idiograph** (id′i-ə-graf´, id′i-ə-gräf´), *n.* نیشانەیەکی کەسی یا تایبەتی (ئیمزا، مۆر).

**idiom** (id′i-əm), *n.* (١) زمانی ناوچە، گەل، یا چینێك. (٢) شێوەی تایبەتی ووشە لێکدان‌و ڕستە دارشتنی زمانێك بۆ مانا بەخشین (٣) زاراوە؛ زاراوەیەك کە دارشتنێکی تایبەتی هەیەو تایبەتی‌یە بە زمانێك‌و گۆڕینی بۆ زمانێکی تر گرانە؛ ئیدیەم. (٤) شێوازی نووسین‌و دووانی مرۆڤێك. (٥) شێوازێکی تایبەتی هونەرو مۆسیقا.

**idiomatic** (id´i-ə-mat′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە زمانێك. (٢) زاراوەی تایبەتی یا ئیدیەمی زۆر تێدایەو بەکاری دەهێنێ *( an ~ language)* (٣) زاراوەیی؛ مانای تایبەتی خۆی هەیە: *( an ~ phrase or expression)*

-idiomatically *(adv.)*.

**idiopathy** (id´i-op′ə-thi), *n.* نەخۆشی‌یەك کە هەر لەخۆوە تووش دەبێ و هۆکەی نەزانراوە

-idiopathic *(adj.)*.

**idiophone** (id′i-ə-fōn′), *n.* ئامێرێکە کە هەر بە لەرینەوەی خۆی دەنگی مۆسیقایی لێ پەید؛ دەبێ (کۆزەنگی لەبەردەرگا هەڵواسراو).

**idiosyncrasy** (id′i-ə-siŋ′krə-si), *n.* (١) سرووشت و بیرکردنەوەی تایبەتی کەسێک (٢) خووی کەسێ؛ خووی تایبەتی کەسێک.

**idiosyncratic** (id′i-ō-sin-krat′ik), *adj.* تایبەتی بە خووی کەسی

-idiosyncratically *(adv.)*.

**idiot** (id′i-ət), *n.* کەسێکی کەرو بێ مێشک

**idiotic** (id′i-ot′ik), *adj.* بێ مێشک؛ کەر؛ کەری

-idiotically *(adv.)*.

**idle** (ī′d′l), *adj.* (١) (أ) هیچ وپووچ؛ پەرپووت.

(ب) بێ سوود؛ بێ کەڵک؛ بێ مانا و ئەنجام: ***( an ~ wish)*** .

(٢) درۆ؛ بێ بنچو بناوان: ***( ~ rumors)***

(٣) (أ) بێ ئیش وکار؛ بەتاڵ: ***( ~ man)*** .

(ب) بەکارنەهێنراو؛ لەکارکەوتوو؛ کارنەکەر: ***( ~ machines)*** .

(ج) کاتی دەستبەتاڵی؛ کاتی بێ ئیشی: ***( ~ hours)*** .

(٤) تەمەڵ ***( an ~ person)***

*v.i.* (١) تەمەڵی کردن؛ کات کوشتن؛ هیچ نەکردن؛ سووڕانەوە؛ خولستنەوە

(٢) گەڕان یا کارکردن بە هێواشی و ووزە نەدان بە هیچ لایەکی تر (مەکینە).

***( The engine is ~ing.)***

*v.t.* (١) بەفیڕۆدان (کات)؛ کوشتن (کات):

***( He ~d away his youth.)***

(٢) خستنەگەڕو وازلێهێنان بۆ کارکردن بە هێواشی (مەکینە):

***( to ~ a motor)***

-idleness *(n.)*; idly *(adv.)*.

**idle pulley,** خولخولوکەی بەرەڵا یا بێکار

**idler** (ī′dlẽr), *n.* (١) کەسێکی تەمەڵ.

(٢) خولخولوکە یا پێچکەی ناوەڕاستی بێکار.

**idle wheel,** ڕەوەرەوەی ناوەڕاست، بێکار، یا بەرەڵا کە لە بەینی دوو ڕەوەرەوەی تردایەو تەنها ووزە دەبات لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی تر.

**idol** (ī′d′l), *n.* (١) بت (٢) شتێکی پەرستراو.

(٣) [Obs.] (أ) وێنە؛ پەیکەر (ب) تارمایی؛ سێبەر؛ خێو؛ شەبەنگ؛ وێنەی ناو ئاوێنە (٤) بیری هەڵە (ژیربێژی).

**idolater** (ī-dol′ə-tẽr), *n.* (١) بت پەرست (٢) پەرست؛ پەرستەر

**idolatress** (ī-dol′ə-tris), *n.* ژنێکی بت پەرست

**idolatrize** (ī-dol′ə-trīz′), *v.t.* پەرستن

*v.i.* بت پەرستن

**idolatrous** (ī-dol′ə-trəs), *adj.* (١) تایبەتی بە بت پەرستن

(٢) بت پەرستی (٣) زۆر خۆش ویست؛ پەرست.

**idolatry** (ī-dol′ə-tri), *n.* (١) بت پەرستی؛ بت پەرستن.

(٢) پەرستن

**idolize** (ī′d′l-īz′), *v.t.* (١) پەرستن وەک بت؛ کردن بە بت

(٢) پەرستن بە ئەندازە بەدەر شکۆپێدان.

*v.i.* بت پەرستن

-idolization *(n.)*.

**idyl, idyll** (ī′d′l), *n.* (١) هەڵبەستێک یا پەخشانێک لە بابەت ژیانی خۆش و دیمەنی جوانی لادێوە (٢) باسێک یا دیمەنێک کە بۆ ئەم جۆرە هۆنراوەیە شێت (٣) هەڵبەستێکی درێژ (٤) پارچەیەک مۆسیقای سادە.

**idylist, idyllist** (ī′d′l-ist), *n.* هۆنەری هەڵبەستێک لە بابەت لادێ

**idyllic** (ī-dil′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە هەڵبەستی دەربارەی لادێ.

(٢) خۆش و سادەو جوان و دڵگیر؛ هی لادێ و شوانێتی و شوێنی جوان:

***( an ~ place, life, existence)***

-idyllically *(adv.)*.

**i.e. id est** [L.], = that is., واتە

**if** (if), *conj.* (١) ئەگەر:

***( I~ I come, I'll see him.; I~ I were you I wouldn't do that.)***

(٢) ئەگەرچی: ***( I~ it was wrong, it was at least meant well.)*** .

(٣) ئایا؛ بڵێی: ***( I wonder ~ he can do it.)***

(٤) خۆزگە: ***( I~ I had only known!)***

*n.* (١) ئەگەر؛ ئەگەرچی؛ ئایا؛ بڵێی؛ خۆزگە. (٢) مەرج؛ گریمانەکی

as if, دەڵێی؛ لەوە دەچێ؛ وەک ئەوە وایە.

ifs, ands, or buts, چەندوچۆن.

**igloo, iglu** (ig′lōō), *n.* کوختەی ئەسکیمۆی گومەزی وەک سەهۆڵین

**igneous** (ig′ni-əs), *adj.* (١) ئاگرین؛ ئاگری.

(٢) ئاگریژێنی؛ بە ئاگریژێن دروست بووە: ***( ~ rock)*** .

**ignescent** (ig-nes′′nt), *adj.* (١) گرگر

(٢) پریشکی لێ دەبێتەوە (وەک بەردەستێ).

**ignitable, ignitible** (ig-nī′tə-b′l), *adj.* گردەگرێت؛ دەسووتێت

**ignite** (ig-nīt′), *v.t.* (١) ئاگرتێبەردان؛ ئاگرپێوەنان؛ سووتاندن؛ داگیرساندن؛ گرتێبەردان.

(٢) هێنانەجۆش؛ خستنەجۆش: ***( His speech ~d the crowd.)***

*v.i.* ئاگرگرتن؛ گرگرتن؛ سووتان.

-igniter; ignitor *(n.)*.

**ignition** (ig-nish′ən), *n.* (١) ئاگر تێبەردان؛ گر تێبەردان؛ ئاگرگرتن؛ گرگرتن؛ سووتان (٢) سووتێنەر؛ گرتێبەردەر؛ داگیرسێنەر.

(٣) پریشکی کارەبایی؛ سویچ

(٤) گەرم کردنی ئاوێتەیەک تا پلەی گرگرتن

**ignition key,** سویچی ئوتومبیل.

**ignoble** (ig-nō′b′l), *adj.* (١) ناکەس؛ نارەسەن؛ بنەچە نزم.

(٢) بێ ناموس؛ نزم؛ ناپیاو؛ بێ شەرەف؛ سووک

-ignobly *(adv.)*.

**ignominious** (ig′nə-min′i-əs), *adj.* (١) شوورەیی؛ ناشرین؛ ئابرووبەر؛ حەیابەر؛ شەرمەزارکەر. (٢) پیس وبوگەن؛ نزم. (٣) ڕیسوا کەر.

**ignominy** (ig′nə-min′i), *n.* (١) ڕیسوایی؛ سووکی؛ حەیاو ناموس چوون؛ ئابرووچوون. (٢) کردەوە، ڕەووشت، یا کردارێکی بێ ئابروو ئەو سووک و حەیابەرانە.

**ignoramus** (ig′nə-rā′məs), *n.* کەسێکی هیچ نەزان

**ignorance** (ig′nẽr-əns), *n.* (١) هیچ نەزانی؛ هیچ نەزانین؛ نەخوێندەواری؛ نەشارەزایی (٢) بێ ئاگایی؛ نەزانین (شتێکی تایبەتی)

**ignorant** (ig′nẽr-ənt), *adj.* (١) هیچ نەزان؛ نەزان؛ نەخوێندەوار؛ نەشارەزا (٢) نیشانەی هیچ نەزانییە؛ هۆی هیچ نەزانییە

(٣) ( ~ of ) بێ ئاگا: ***( to be ~ of a new law.)***

**ignore** (ig-nôr′, ig-nōr′), *v.t.* (١) گوێ پێ نەدان؛ گوێ لێ کەرکردن؛ سەرنج پێ نەدان؛ خستنە پشت گوێ؛ پشت تێکردن؛ خۆ تێ نەگەیاندن؛ چاو لێ پۆشین. (٢) فڕێدانە دەرەوە یا پەسەندنەکردنی تاوانامە (دادگا).

**iguana** (i-gwä′nə), *n.* مارمێلکەیەکی زۆر زلی ترۆپیکی ئەمەریکییە لەسەر داروردەخت دەژی.

**ikon** (ī′kon), *n.* = **icon.**

**ileitis** (il′i-ī′tis), *n.* هەوکردنی بەشی خوارووی ڕیخۆڵە باریکە.

**ileum** (il′i-əm), *n.* بەشی خوارووی ڕیخۆڵە باریکە

-ileac; iliac *(adj.)*.

**ileus** (il′i-əs), *n.* ڕیخۆڵە گیران یا گرفتێکە کە دەبێتە هۆی ژان و ڕشانەوەو خوێن پیسی.

**ilex** (ī′leks), *n.* (١) داربەڕوویەکی هەمیشە سەوزە.

(٢) holly .

**Iliad** (il′i-əd), *n.* ئیلیاد؛ داستانی هۆنەری کۆنی بەناوبانگی یۆنان " هۆمەر "

**-ility** (il′ə-ti), پاشگرێکە بەمانای: وەهابوون؛ لە بارێکی وەهادابوون:

***( ability, civility, sensibility)***

**ilium** (il′i-əm), ***n.*** بەشی ژووروی سمتەجوڵە؛ کلۆت.

**ilk** (ilk), ***adj.*** [Obs.], هەمان؛ هاو. چوونیەك.
***pron.*** [Obs.], هەمان شت
***n.*** [Colloq.], توخم؛ بابەت؛ چەشن؛ خێزان: ***( of that ~ )*** .
**of that ilk,** (١) هەمان ناو. یا شوێن. یا خێزان.
(٢) هەمان توخم. چەشن. بابەت. یا چین.

**ill** (il), ***adj.*** (١) نەخۆش. بیمار؛ خەستە؛ ناساغ.
(٢) بەد؛ ناپەسەند ***( ~ repute)*** .
(٣) بەدووم؛ بەدبەخت: ***( ~ fortune)*** .
(٤) ناحەز؛ دوژمنانە؛ دژ؛ بەدخوازی. ***( ~ will)*** .
(٥) ناخۆش. خراپ: ***( ~ news)*** .
(٦) توندوتیژ؛ بەزەبر؛ نامرۆڤانە: ***( ~ treatment)*** .
(٧) ناپەسەند؛ نارەسەن؛ ناتەواو؛ بەد: ***( ~ breeding)*** .
***n.*** خراپە؛ شتیکی بەدو ناپەسەند؛ نەخۆشی؛ ناخۆشی؛ دژواری.
***adv.*** (١) بە خراپی؛ بە ناتەواوی؛ بە هەڵە؛ بە ناپەسەندانە.
(٢) بە دڵرەقی؛ بە بێ بەزەییانە؛ بە توندوتیژی.
(٣) بە رەحمەت؛ بەحاڵ ***( He can ~ afford to refuse.)*** .
**ill at ease,** نارەحەت. بێ نارام؛ بێ تاقەت.

**I'll** (īl), **(1) I shall. (2) I will.**

**ill-advised** (il′əd-vīzd′), ***adj.*** نازیرانە؛ نابەجێ. بێ عەقڵانە:
***( an ~ plan, act, etc.)***
**-ill-advisedly** ***(adv.).***

**illation** (i-lā′shən), ***n.*** (١) گەیشتنە ئەنجام (ژیربێژی).
(٢) ئەنجام
**-illative** ***(adj.).***

**ill-being** (il′bē′iŋ), ***n.*** ناخۆشی. مەینەتی. نەخۆشی؛ بەدی؛
خراپی. خەمباری. کوێرەوەری.

**ill-boding** (il′bōd′iŋ), ***adj.*** بەدووم

**ill-bred** (il′bred′), ***adj.*** (١) بەدرەوشت. بەدخوو؛ بێ ئەدەب؛
بێ رەووشت (٢) نارەسەن.

**ill-defined** (il′di-fīnd′), ***adj.*** باش دیاری نەکراو. ڕوون نەکراوە؛
لێڵ

**ill-disposed** (il′dis-pōzd′), ***adj.*** (١) بەدخوو؛ بەد
(٢) ڕوونخۆش. حەز لێ نەکەر؛ نەویست؛ پەسەندنەکەر:
***( to be ~ toward somebody)***

**illegal** (i-lē′gəl), ***adj.*** قەدەغە؛ نایاسایی. یاساغ؛ نادەستووری
**-illegally** ***(adv.).***

**illegality** (il′ē-gal′ə-ti), ***n.*** (١) قەدەغەیی. نایاسایی؛ یاساغی
(٢) کردارێکی قەدەغە

**illegible** (i-lej′ə-b'l), ***adj.*** ناخوێنرێتەوە (دەستنووس)؛ ناتوانرێ
بخوێنرێتەوە
**-illegibility** ***(n.)***; **illegibly** ***(adv.).***

**illegitimate** (il′i-jit′ə-mit), ***adj.*** (١) زۆڵ. ناکەس بەچە؛
حەرام زادە (٢) نابەجێ. هەڵە (ژیربێژی).
(٣) قەدەغە؛ نارەوا؛ نادەستووری
(٤) هەڵەیە بەپێی ڕێزمان.
**-illegitimacy** ***(n.).***

**ill-fated** (il′fāt′id), ***adj.*** (١) بەدبەخت؛ بێ بەخت؛ سەرکەوتنی بۆ
نەنووسراوە؛ چارەڕەش ***( an ~ person, mission, etc.)***
(٢) بەدووم

**ill-favored** (il′fā′vērd), ***adj.*** (١) ناشرین؛ بەدڕوخسار.
(٢) ناپەسەند؛ بەد؛ ناشرین (کردەوە. ڕەووشت).

**ill-founded** (il′foun′did), ***adj.*** بێ بناغە؛ درۆ؛ نابەجێ. شلۆق

**ill-gotten** (il′got′'n), ***adj.*** (١) بە نارەوایی دەستکەوتوو؛ حەرام
(٢) لە ڕێی جەوتەوە دەستکەوتووە ***( ~ gains)***

**ill humor,** تەنگەجیکلانەیی؛ تووڕەوتڕۆیی؛ تەنگەتیلکەیی.

**ill humored** (il′hū′mērd), ***adj.*** تەنگەجیکلانە؛ تووڕەوتڕۆ؛
تەنگەتیلکە؛ مڕومۆن.

**illicit** (i-lis′it), ***adj.*** قەدەغە؛ نایاسایی؛ یاساغ.

**illimitable** (i-lim′i-tə-b'l), ***adj.*** بێ شومار؛ بێ پایان؛ ئێجگار زۆر؛
بێ سنوور.

**illiteracy** (i-lit′ēr-ə-si), ***n.*** (١) نەخوێندەواری.
(٢) هەڵەیەکی زل (لە نووسین یا دوواندا لە ئەنجامی نەخوێندەواریدا).

**illiterate** (i-lit′ēr-it), ***adj.*** (١) نەخوێندەوار
(٢) هیچ نەزان (لە زانست یا باسێکدا)؛ نەشارەزا: ***( He is musically ~ )***
***n.*** کەسێکی نەخوێندەوار.

**ill-mannered** (il′man′ērd), ***adj.*** بێ ڕەووشت؛ بەدڕەفتار؛
بەدخوو؛ بێ ئەدەب.

**ill-natured** (il′nā′chērd), ***adj.*** تەنگەجیکلانە؛ تەنگەتیلکە؛
تووڕەوتڕۆ؛ مڕومۆن؛ بەدسرووشت.

**illness** (il′nis), ***n.*** نەخۆشی؛ ناساغی؛ دەرد.

**illogical** (i-loj′i-k'l), ***adj.*** نابەجێ (ژیربێژی)؛ ناچێتە مێشکەوە؛
بێ مانا؛ بێ جێ.

**ill-omened** (il′ō′mənd), ***adj.*** بەدووم.

**ill-spent** (il′spent′), ***adj.*** بەفیڕۆدراو

**ill-starred** (il′stärd′), ***adj.*** چارەڕەش؛ بەدبەخت؛ بێ بەخت.

**ill-suited** (il′sōōt′id,il′sōōt′id), ***adj.*** نەشیاو؛ نەگونجاو؛
بەکارنایەت.

**ill-tempered** (il′tem′pērd), ***adj.*** تەنگەجیکلانە؛ تەنگەتیلکە؛
تووڕەوتڕۆ؛ مڕومۆن.

**ill-timed** (il′tīmd′), ***adj.*** لە کاتی خۆیدا نییە؛ لە جێی خۆیدا نییە؛
ناوەخت: ***( an ~ remark)*** .

**ill-treat** (il′trēt′), ***v.t.*** بە ناشرینی لەگەڵدا جووڵانەوە؛ ئازاردان؛
دڵڕەقی لەگەڵ کردن.
**-ill-treatment** ***(n.).***

**illume** (i-lōōm′, i-lūm′), ***v.t.*** **illuminate.**

**illuminate** (i-lōō′mə-nāt′, i-lū′mə-nāt′), ***v.t.*** (١) ڕووناك
کردنەوە؛ ڕۆشن کردنەوە. (٢) (ا) ڕوونکردنەوە؛ دەرخستن. (ب) پێ ووتن؛
چاوکردنەوە؛ ئاگادارکردن. (٣) ناودارکردن؛ بەناوبانگ کردن.
(٤) ڕازاندنەوە بە گڵۆپ
(٥) (ا) ڕازاندنەوەی یەکەم تیپ یا ووشە بە نەخشەی زێڕین.
(ب) ڕازاندنەوەی دەستنووس یا پەراوێز.
***v.i.*** ڕۆشن بوونەوە؛ ڕووناك بوونەوە.

**illuminati** (i-lōō′mə-nä′tī, i-lū′mə-nä′tī), ***n.*** دەستە یا چینی
ڕۆشنبیران.

**illumination** (i-lū′mə-nā′shən), ***n.*** (١) ڕۆشن کردنەوە؛
ڕووناك کردنەوە؛ ڕووناك بوونەوە. (٢) ڕوونکردنەوە؛ دەرخستن
(٣) پێ ووتن؛ ئاگادارکردن. (٤) ڕازانەوە بە گڵۆپ.
(٥) ڕازاندنەوەی دەستنووس، پەراوێز، یا ووشەی یەکەم بە نەخشەو ڕەنگ
(٦) ڕووناکی. (٧) نەخشەی ڕازاندنەوەی دەستنووس.
(٨) گڵۆپی ڕازاندنەوەی شار.

**illuminative** (i-lū′mə-nā′tiv), ***adj.*** ڕووناککەرەوە؛
ڕۆشنکەرەوە؛ ڕوونکەرەوە.

**illuminator** (i-lū′mə-nā′tēr), ***n.*** (١) ڕووناککەرەوە (مرۆڤ. ئامێر)
(٢) ئامێری تیشکدار؛ تیشکهاوێژ. یا تیشك خڕکەر.
(٣) ڕازێنەرەوەی دەستنووس بە نەخشەو ڕەنگ.

**illumine** (i-lōō′min, i-lū′min), ***v.t.*** **illuminate.**

**ill-usage** (il′ūs′ij, il′ūz′ij), ***n.*** بە ناشرینی لەگەڵ جووڵانەوە؛
دڵرەقی لەگەڵ کردن

**ill-use** (il′ūz′), ***v.t.*** بە ناشرینی یا توندوتیژی لەگەڵ جووڵانەوە؛

دڵرەقی نەگەڵ کردن.

**illusion** (i-lōō′zhən, i-lū′zhən), *n.* (١) بیری هەڵە
(٢) سەراو؛ گازاو. (٣) خەیاڵ؛ کڵاوی بابردوو. (٤) قوماشی پەچە.
-illusional *(adj.)*; illusionary *(adj.)*.

**illusionist** (i-lōō′zhən-ist, i-lū′zhən-ist), *n.* (١) خەیاڵ پلاو؛
خەیاڵ پەرست. (٢) جادووگەر (بەتایبەتی ئەوەی کە بیناییمان هەڵدەخەڵەتێنێ).

**illusive** (i-lōō′siv, i-lū′siv), *adj.* بەهەڵەبەر؛ درۆ؛ خەیاڵی؛
هەڵخەڵەتێنەر؛ سەراوی؛ تارمایی

**illusory** (i-lōō′sēr-i, i-lū′sēr-i), *adj.* = **illusive.**

**illustrate** (il′əs-trāt′, i-lus′trāt), *v.t.* (١) (ا) ڕوونکردنەوە؛
دەرحستن. (ب) ڕوونکردنەوە بە نموونەو بەراوردکردن؛ پیشاندان.
(٢) (ا) ڕوونکردنەوەی پەڕتووك یا باسێك بە وێنەو نەخش.
(ب) ڕوونکردنەوە (وێنە)؛ ڕازاندنەوە.
(٣) [Obs.]. (ا) ڕۆشنکردنەوە. (ب) ڕازاندنەوە. (ج) بەناوبانگ کردن.

**illustration** (il′əs-trā′shən), *n.* (١) ڕوونکردنەوە؛ ڕوونکرانەوە؛
پیشاندان. (٢) نموونەی ڕوونکەرەوە. (٣) وێنەو نەخشو نیگاری ڕوونکەرەوە
یا ڕازێنەرەوە

**illustrative** (i-lus′trə-tiv, il′əs-trā′tiv), *adj.* ڕوونکەرەوە؛
پیشاندەر؛ دەرخەر.

**illustrator** (il′əs-trā′tēr, i-lus′trā′tēr), *n.* وێنەو نەخشو
نیگار کەر (بۆ ڕوونکردنەوەی باسی ناو پەڕتووك یا گۆڤارێك).

**illustrious** (i-lus′tri-əs), *adj.* (١) تیشکدار؛ بریقەدار؛ ڕۆشن؛
ڕووناك؛ تیشکهاوێژ. (٢) بەناوبانگ؛ بەناو؛ ناسراو: *( an ~ man)* .

**ill will,** ناحەزی؛ دوژمنایەتی؛ ڕق؛ قین؛ بەدخوازی.

**ill wisher** (il′wish′ēr), *n.* بەدخواز؛ ناحەز

**I'm** (īm), = **I am,** من

**image** (im′ij), *n.* (١) (ا) پەیکەر. (ب) بت. (ج) پەیکەری ئاینی؛ ئەیقوون.
(٢) وێنە؛ وێنەی قەبارەدار. (٣) وێنەی ناو ئاوێنە.
(٤) وێنەی دەقاودەق *( He is the ~ of his father.)* .
(٥) وێنەی مێشکی؛ بیر.
(٦) نموونە؛ وێنە: *( He is the ~ of laziness.)* .
(٧) وەسفێکی ڕوون؛ لاسایی؛ وێنە؛ وێنەی زیندوو:
*( The play is the ~ of life.)*
(٨) ناوبانگ؛ ناو:
*( He is concerned about his ~ in the community.)*
(٩) بریتی (ووشە)؛ مەجاز (ڕەوانبێژی).
(١٠) وێنەیەکی مێشکی بەرز دەربارەی خۆ یا دایكو باوك (دەروونناسی).
*v.t.* (١) پیشاندان؛ ڕوونکردنەوە (بە وێنە). (٢) دانەوە (وێنەی ئاوێنە).
(٣) هێنانە بەرچاوی خۆ. (٤) نموونەکاری کردن.
(٥) بە ڕوونی باسکردن؛ وەسف کردن.

**imagery** (im′ij-ri, im′ij-ēr-i), *n.* (١) پەیکەر؛ بت؛ پەیکەری ئاینی؛
وێنەی قەبارەدار؛ وێنە. (٢) وێنەی مێشکی.
(٣) ووشەو ڕستەی بریتی لە؛ ووتەی مەجازی (ڕەوانبێژی):
*( Shakespear's poetry is rich in ~ .)*

**imaginable** (i-maj′i-nə-b'l), *adj.* دەهێنرێتە بەرچاوی خۆ؛
ڕێی تێ دەچێ؛ ڕێ تێ چوو.
-imaginably *(adv.)*.

**imaginary** (i-maj′i-ner′i), *adj.* تەنها لە مێشکدایە؛ خەیاڵی؛
نەدیدە؛ نەبینراو؛ نەدیو؛ ناڕاست.

**imagination** (i-maj′i-nā′shən), *n.* (١) (ا) خەیاڵ
(ب) توانای هێنانە بەرچاوی خۆ. (ج) هێنانە بەرچاوی خۆ.
(٢) وێنەی مێشکی؛ شتێکی هێنراوە بەرچاوی خۆ.
(٣) دالغە؛ بیرێکی منداڵانەی بەسەرداهاتووی سەردەمی.
(٤) توانای تێگەیشتنو نرخ زانینی بەرهەمی هونەریو وێژەیی.
-imaginational *(adj.)*.

**imaginative** (i-maj′i-nā′tiv), *adj.* (١) (ا) خەیاڵ فراوان؛ دانا؛
خاوەن بیروباوەڕی تازە؛ دانەری شتی تازە؛ زرنگ: *( an ~ person)* .
(ب) حەز لە خەیاڵ کەر؛ خەیاڵکار.
(٢) خەیاڵی؛ خەیاڵکەر؛ ئەنجامو بەرهەمی خەیاڵە: *( ~ literature)*

**imagine** (i-maj′in), *v.t. & v.i.* (١) هێنانە بەرچاوی خۆ؛
بە بیردا هاتن؛ بۆچوون؛ خەیاڵ کردن؛ خەیاڵ کردنەوە.
(٢) وا دانان؛ وا زانین؛ لا وابوون: *( I ~ she is a good cook.)* .

**imagism** (im′əj-iz'm), *n.* شێوازو بزووتنەوەیەکی وێژەیی سەرەتای
سەدەی بیستە بریتییە لە دەربڕینی باسی تازە بە وێنەی ڕوونو وورد لە
هۆنراوەی ئازاد، واتە بێ " قافیە " دا.
-imagist *(n.)*; imagistic *(adj.)*.

**imago** (i-mā′gō), *n.* (١) (ا) دوا قۆناغی بار گۆڕینی جانەوەر.
(ب) جانەوەرێك لەم دوا قۆناغی گۆڕینەدا.
(٢) وێنەیەکی مێشکی بەرز دەربارەی خۆ یا دایكو باوك (دەروونناسی).

**imam** (i-mäm′), *n.* (١) ئیمام؛ بەرنوێژ؛ مەلا. (٢) زانای ئیسلام.
(٣) [-I]، خەلیفە؛ ئیمام.

**imbalance** (im-bal′əns), *n.* لاسەنگی؛ ناهاوتایی؛ لەنگی.

**imbecile** (im′bə-s'l), *adj.* بێ مێشك؛ کەر؛ گێل.
*n.* کەسێکی بێ مێشك یا کەر.
-imbecility *(n.)*.

**imbed** (im-bed′), *v.t.* = **embed.**

**imbibe** (im-bīb′), *v.t.* (١) خواردنەوە. (٢) (ا) هەڵمژین (ئاو).
(ب) هەڵکێشان (هەناسە)؛ هەناسە هەڵمژین.
(٣) خستنە مێشکەوە؛ تێگەیشتن؛ مێشك پڕکردن.
*v.i.* خواردنەوە

**imbitter** (im-bit′ēr), *v.t.* = **embitter.**

**imbosom** (im-booz′əm, im-bōō′zəm), *v.t.* embosom.

**imbricate** (im′bri-kāt′), *adj.* (١) سواری یەکتر بوو (پوولەکەی
ماسی، خشت). (٢) ڕازاوە بە نەخشی سوار یەکتر بوو.
*v.t.* سواری یەکتر کردن (خشت، تەختە، تەبەقە کانزا).
*v.i.* سواری یەکتر بوون.
-imbricated *(adj.)*; imbrication *(n.)*.

**imbroglio** (im-brōl′yō), *n.* (١) کۆمەڵێکی شێواو.
(٢) بارێکی ئاڵۆز؛ پشێوی؛ شێواوی؛ تەنگوچەڵەمە؛ ئاڵۆسکان.

**imbrue** (im-brōō′), *v.t.* لە خوێن هەڵکێشان؛ خوێناوی کردن.

**imbrute** (im-brōōt′), *v.t.* کردن بە دڕندە؛ کردن بە کێوی.
*v.i.* بوون بە دڕندە.

**imbue** (im-bū′), *v.t.* (١) لە شلە هەڵکێشان؛ لە ئاو هەڵکێشان؛
تێهەڵکێشان. (٢) خوم کردن؛ لە خوم هەڵکێشان؛ ڕەنگ کردن؛ ڕەنگ لێدان.
(٣) ( **with** ~ )، مێشك پڕکردن؛ پڕکردن (بیر، هەست):
*( to be ~d with partiotism, love, hatred, revolutionary spirit, etc.)*

**imitable** (im′i-tə-b'l), *adj.* لاسایی دەکرێتەوە؛ دەتوانرێ لاسایی
بکرێتەوە.

**imitate** (im′ə-tāt′), *v.t.* (١) (ا) چاولێکردن؛ لەسەر ڕێو شوێن
ڕۆیشتن: *( One should ~ the wise.)* .
(ب) لاسایی کردنەوە. (٢) وێنەی دەقاودەقی ساختە درووستکردن.
(٣) لێچوون؛ لەیەکچوون؛ لێچوواندن:
*( Glass is made to ~ diamonds.)*

**imitation** (im′ə-tā′shən), *n.* (١) (ا) چاولێکەری؛ چاولێکردن.
(ب) لاسایی؛ لاسایی کردنەوە.
(٢) وێنەی درۆ؛ وێنەی لاسایی؛ شتێکی ناڕەسەن.
*adj.* درۆزنە؛ ساختە؛ ناڕەسەن؛ ناپوختە: *( ~ leather)* .

**imitative** (im′ə-tā′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە لاسایی
(٢) ناڕەسەن؛ ناپوختە؛ درۆزنە.

(۳) چاولێکەر؛ لاسایێکەرەوە؛ حەزکەر لە لاسایی کردنەوە.
(٤) هەمان دەنگی' هاودەنگ (ووشەو ماناکەی وەك: **hum, hiss**).
**imitator** (im′ə-tā′tēr), *n.* لاسایێکەرەوە؛ چاولێکەر.
**immaculate** (i-mak′yoo-lit), *adj.* (۱) خاوێن' پاك‌وتەمیز؛ پاك:
*( an ~ room, shirt, etc.)*
(۲) بێگەرد' بێ هەڵە؛ بێ ناتەواوی؛ ڕاست.
(۳) داوێن پاك؛ پاك
**-immaculately** *(adv.)*; **immaculateness** *(n.)*.
**Immaculate Conception,** سکپڕبوونی بێ جووت بوون (ئینجیل).
**immanent** (im′ə-nənt), *adj.* (۱) ناوەکی' ناوخۆ؛ ناوخۆیی.
(۲) لە هەمووشوێنێکدایە؛ گشت جێیی: *( God is ~ .)*.
(۳) تەنها لە مێشکی خۆدایە؛ کەسی؛ خۆتەنی.
**immaterial** (im′ə-têr′i-əl), *adj.* (۱) بە دەست نەگیراو؛ هەست پێ نەکراو؛ گیانی (۲) ناگرنگ؛ بێ بایەخ.
**-immateriality** *(n.)*.
**immature** (im′ə-tyoor′, im′ə-toor), *adj.* (۱) کاڵ' نەگەییو' فەریك؛ نەبەکام (۲) هەرزە؛ نەزان؛ باڕ؛ تێنەگەیشتوو؛ منداڵ (ڕەووشت)؛ منداڵانە: *( ~ behavior)*.
**-immaturely** *(adv.)*; **immaturity** *(n.)*; **immatureness** *(n.)*.
**immeasurable** (i-mezh′ēr-ə-b'l), *adj.* بێ ئەندازە' بێ سنوور؛ ئێجگار زۆر؛ زۆر گەورە.
**-immeasurability** *(n.)*; **immeasurably** *(adv.)*.
**immediacy** (i-mē′di-ə-si), *n.* (۱) یەکسەری؛ کوتوپڕی؛ خێرایی.
(۲) نزیکی (ڕووداو، کات، شوێن). (۳) شتێکی نزیك (لە هەموو ڕوویەکەوە).
(٤) ئاشکرایی و ئاسانی تێگەیشتنی شتێك.
**immediate** (i-mē′di-it), *adj.* (۱) نزیکترین (شوێن)؛ هەرە نزیك؛ تەنیشت (۲) کوتوپڕ؛ کوتوپڕی؛ یەکسەر؛ دەستبەجێ.
(۳) هەرە نزیك (خزم)؛ نزیکترین: *( one's ~ family)*.
(٤) یەکسەر' ڕاستەوخۆ: *( an ~ cause)*.
(٥) نزیك (کات): *( the ~ future)*.
(٦) ئاشکرا' ڕوون؛ دیار؛ تێگەیشتنی ئاسانە.
**-immediateness** *(n.)*.
**immediately** (i-mē′di-it-li), *adv.* دەستبەجێ' یەکسەر؛ کوتوپڕ' خێرا' هەر ئێستا؛ ڕاستەوخۆ؛ گەرماوگەرم.
*conj.* یەکسەر کە' یەکسەر؛ دەستبەجێ.
**immedicable** (i-med′i-kə-b'l), *adj.* بێ دەرمان (نەخۆشی)؛ بێ چارە
**immemorial** (im′mə-mō′ri-əl), *adj.* زۆر کۆن' دێرین؛ لە یادی کەسدا نییە' لە سەرەتای مێژووەوە: *( for time ~ )*.
**immense** (i-mens′), *adj.* (۱) بێ ئەندازە' بێ سنوور؛ ئێجگار زۆر.
(۲) زۆر گەورە؛ زۆر زل.
(۳) [Slang]، زۆرباش؛ نایاب.
**immensity** (i-men′sə-ti), *n.* (۱) (ا) زۆر زل؛ زۆر گەورەیی.
(ب) بێ سنووری؛ بێ ئەندازەیی. (۲) شتێکی زۆر گەورە.
**immensurable** (i-men′shoor-ə-b'l), *adj.* = **immeasurable.**
**immerge** (i-mũrj′), *v.t.* نوقم کردن؛ خستنەناو ئاو یا شلە.
*v.i.* نوقم بوون' ون بوون وەك لەناو ئاودا.
**immerse** (i-mũrs′), *v.t.* (۱) نوقم کردن' خستنە ناو ئاو یا شلەوە؛ بە ئاو داپۆشین (۲) لە ناو هەڵکێشان و کردن بە خاچ پەرست.
(۳) لە بیرکردنەوەدا نوقم بوون؛ زۆر سەرقاڵ بوون و خۆ لەبیرچوونەوە:
*( He was ~d in thought.; He ~d himself in work.)*
**immersed** (i-mũrst′), *adj.* (۱) نوقم بوو؛ بە ئاو یا شلە داپۆشراو: *( ~ in water)*
(۲) کراو بە خاچ پەرست بە هەڵکێشان لە ئاو.
(۳) تیا چەسپیو. (٤) لەژێر ئاودا ڕوواو.
(٥) زۆر سەرقاڵ؛ زۆر خەریك.
**immersion** (i-mũr′shən, i-mũr′zhən), *n.* (۱) نوقم کردن؛ نوقم بوون؛ بە ئاو یا شلە داپۆشران. (۲) هەڵکێشانی ئادەمی لە ئاو و کردنی بە خاچ پەرست. (۳) گیران یا ون بوونی ئەستێرەیەك لە پاڵ یا لەبەر سێبەری ئەستێرەیەکی تردا
**immigrant** (im′ə-grənt), *n.* کۆچکەر.
*adj.* کۆچکەر.
**immigrate** (im′ə-grāt′), *v.i.* کۆچ کردن؛ کۆچ کردن بۆ وولاتێکی تر.
*v.t.* کۆچ پێکردن.
**immigration** (im′ə-grā′shən), *n.* (۱) کۆچ کردن؛ کۆچ کردن بۆ وولاتێکی تر؛ کۆچ و ڕەو. (۲) ژمارەی کۆچکەران بۆ وولاتێك لە ماوەیەکی دیاریکراودا.
**imminence** (im′ə-nəns), *n. Also* **imminency,** (۱) نزیکی- (کاتی ڕوودان)؛ نزیکی ڕوودانێك؛ خەریکی ڕوودان بوون.
(۲) شتێك کە خەریکە ڕووبدات (بەتایبەتی هی بەدووم و ناپەسەند).
**imminent** (im′ə-nənt), *adj.* خەریکە ڕووبدات (شتی بەدووم و ناپەسەند)؛ نزیك (کاتی ڕوودان):
*( War between the two countries is ~ . )*
**immingle** (im-miŋ′g'l), *v.t.* تێکەڵاوکردن.
*v.i.* تێکەڵ بوون.
**immobile** (i-mō′b'l, im-mō′bēl), *adj.* (۱) چەسپیو؛ قایم؛ نەبزۆك. (۲) (ا) ناجووڵێت؛ ناتوانێ بجووڵێت یا ببزوێ.
(ب) ناجووڵێنرێت؛ ناتوانرێت بجووڵێنرێت.
**immobility** (im′ō-bil′ə-ti, im′mō-bil′ə-ti), *n.* (۱) قایمی؛ چەسپیوی. (۲) نەجووڵان؛ نەتوانینی جووڵاندن یا بزوان.
**immobilize** (i-mō′b'l-īz′, im-mō′b'l-īz′), *v.t.* (۱) پەککخستن.
(۲) لە جووڵە خستن؛ ڕێ لێگرتن.
(۳) کێشانەوەی پارەی ڕەق لە بازاڕ لەلایەن بانق یا میرییەوە.
**-immobilization** *(n.)*.
**immoderate** (i-mod′ēr-it), *adj.* (۱) زۆر؛ لە ئەندازە بەدەر؛ نابەجێ: *( ~ spending)*
(۲) [Obs.]، بێ سنوور؛ بێ ئەندازە.
**-immoderately** *(adv.)*; **immoderateness** *(n.)*.
**immodest** (i-mod′ist), *adj.* (۱) (ا) بێ شەرم؛ ناشرین (ڕەووشت)؛ نابەجێ. (ب) بێ حەیا؛ ڕووقایم (۲) لەخۆبایی؛ بەفیز؛ لاف لێدەر.
**-immodestly** *(adv.)*; **immodesty** *(n.)*.
**immolate** (im′ə-lāt′), *v.t.* بەختکردن؛ کردن بە قوربانی.
**-immolator** *(n.)*.
**immolation** (im′ə-lā′shən), *n.* (۱) بەختکردن؛ کردن بە قوربانی.
(۲) قوربانی؛ شتی بەختکراو.
**immoral** (i-môr′əl, i-mor′əl), *adj.* (۱) بێ ڕەووشت؛ بەدڕەفتار؛ بەدڕەووشت؛ بەدکار؛ ناڕەوا؛ چەوت:
*( an ~ person, act, behavior, etc.)*
(۲) سەرسەری؛ داوێن پیس؛ بێ ئابڕوو؛ بەرەڵا.
**immorality** (im′ə-ral′ə-ti), *n.* (۱) بەدڕەووشتی؛ بێ ڕەووشتی؛ بەدڕەفتاری؛ بەدکاری. (۲) سەرسەرێتی؛ داوێن پیسی؛ بێ ئابڕوویی' بەرەڵایی.
(۳) کارێکی بەدڕەووشتانە یا بێ ئابڕووانە.
**immortal** (i-môr′t'l), *adj.* (۱) نەمر؛ بێ مەرگ؛ قەت نەمر
(۲) هەتا هەتایی؛ هەتا هەتا. (۳) هەرگیز لەیادنەچوو؛ نەمر.
*n.* (۱) کەسێکی نەمر؛ کەسێکی هەرگیز لە یاد نەچوو.
(۲) بوونەوەرێکی نەمر (خوداکانی ئەفسانەی یۆنانی).
**immortality** (im′ôr-tal′ə-ti), *n.* نەمری؛ نەمرێتی؛ نەمردن؛ بێ مەرگی؛ هەتا هەتایی؛ هەرگیز لەیادنەچوون.
**immortalize** (i-môr′t'l-īz′), *v.t.* نەمرکردن؛ کردن بە نەمر؛

گیانی هەتا مەتایی کردن بە بەردا:
*( to ~ a person in a song or poem)*
**immotile** (im-mō′t'l), *adj.* نەبزۆك؛ چەسپاو، نەجوولاو.
**-immotility** *(n.)*.
**immovable** (i-mōōv′ə-b'l), *adj.* (١) (ا) چەسپاو؛ ناجوولێنرێت
(ب) ناجوولێت؛ ناتوانێت ببزوێت. (٢) نەبزۆك؛ جێگیر. (٣) نەگۆڕ؛ پتەو.
(٤) بێ هەست؛ هەست سارد. (٥) ناگوێزرێتەوە (سامان).
*n.* (١) کەسێك یا شتێکی نەبزۆك.
(٢) سامانی نەبزۆك یا نەگوێزراوە (خانوو، زەویوزار).
**-immovability** *(n.)*; **immovably** *(adv.)*.
**immune** (i-mūn′), *adj.* (١) هیچ کاری تێ ناکات؛ بەدەر؛ لێ بەدەر؛
پارێزراو، ئازاد (سزا، نەخۆشی). (٢) نەخۆشی ناگرێ؛ بەرهەڵستی نەخۆشی
دەکات؛ کوتراو (پزیشکەوانی)
**immunity** (i-mū′nə-ti), *n.* (١) لێ بەدەری (ئەرك، باج، سەربازی،
پەیڕەو)؛ نەگرتنەوە (یاسا، پەیڕەو)؛ بەدەربوون؛ پاراستن؛ ئازادی (لە سزا،
یاسا... هتد)؛ پارێزگاری: *( He has diplomatic ~ )*.
(٢) نەخۆشی نەگرتن؛ هێزی بەرهەڵستی نەخۆشی؛ نەخۆشی کار تێ نەکردن.
**immunize** (im′yoo-nīz′), *v.t.* کوتان (پزیشکەوانی)
**-immunization** *(n.)*.
**immuno-** (i-mū′nō), پێشگرێکە بەمانای: توانای بەرهەڵستی هەبوون؛
نەخۆشی نەگرتن؛ لێ بەدەر.
**immunology** (im′yoo-nol′ə-ji), *n.* زانستی بەرهەڵستی
نەخۆشی و نەخۆشی نەگرتن (پزیشکەوانی).
**immure** (i-myoor′), *v.t.* (١) بەستنەوە؛ بە دیوار دەورگرتن؛
ئابلووقەدان؛ بە دیل گرتن؛ دەستبەسەرکردن.
(٢) گۆشەگرتن؛ خۆ تیا وون کردن یا ناشتن:
*( He ~d himself in his books.)*
**-immurement** *(n.)*.
**immutable** (i-mū′tə-b'l), *adj.* نەگۆڕ، نەگۆڕاو؛ هەرگیز ناگۆڕێ.
**-immutability** *(n.)*; **immutably** *(adv.)*.
**imp** (imp), *n.* (١) منداڵ، بەچە (٢) بەچە شەیتان.
(٢) منداڵێکی کەتنباز، هاروهاج، یا سەر بە گۆبەن
*v.t.* (١) موتوربەکردن، پەیوەزکردن.
(٢) چاکردنەوەی باڵ یا کلکی باز بە موتوربەکردنی پەڕ. (٣) باڵ بۆ کردن.
(٤) یارمەتیدان بە بۆ زیادکردن.
**impact** (im-pakt′), *v.t.* (١) ڕیزکردن، پەستنەوە؛ لێکدان؛ یەکخستن
(٢) بەیەکدادان؛ بەریەك کەوتن؛ بەرکەوتن؛ لێدان.
(٣) کارتێکردن: *( to ~ a situation)*.
*n.* (١) بە قایم بەریەك کەوتن؛ بەتوند بەیەکدادان.
(٢) کار، کارتێکردن: *( The ~ of the news on the family.)*.
**-impaction** *(n.)*.
**impacted** (im-pak′tid), *adj.* ڕێی هاتنەدەرەوەی لێ گیراوە (ددان).
**impair** (im-pâr′), *v.t.* زیان لێدان، زیان پێ گەیاندن؛ کزکردن (توانا)؛
توانا کەمکردنەوە *( to ~ one's ability to see)*.
**-impairment** *(n.)*.
**impale** (im-pāl′), *v.t.* (١) تەیمان کردن؛ بە مێخ یا سنگ دەورەدان.
(٢) (ا) مێخێکی نووك تیژ پیاکردن؛ کردن بە نووکی شتێکی تیژەوە.
(ب) کوشتن یا ئازاردان بە مێخی تیژ کردن بە لەشدا؛ کوشتن بە پیادانی
کەسێك بە شیروتیر یا مێخی تیژدا؛ خۆکوشتن بە خۆ پیادان بە شیروتیر،
چەقۆ، یا مێخی تیژدا *( He ~d himself on a sword.)*.
(٣) پەکخستن، سڕکردن؛ پیاچوون (وەك شتی تیژ):
*( Her glance ~d him.)*
(٤) لێکدانی دوو درووشمی سوارچاکی و خانزادەیی لەسەر یەك قەڵغان.
**-impalement** *(n.)*.
**impalpable** (im-pal′pə-b'l), *adj.* (١) هەست پێ نەکراو
(٢) زۆر کەم؛ هەستی پێ ناکرێ لەبەر کەمی: *( ~ differences)*
**-impalpability** *(n.)*; **impalpably** *(adv.)*.
**impart** (im-pärt′), *v.t.* (١) بەشدان؛ بەش پێدان؛ پێدان.
(٢) پێ ووتن؛ پێ ڕاگەیاندن؛ پێ گەیاندن: *( to ~ news)*.
**-impartation** *(n.)*.
**impartial** (im-pär′shəl), *adj.* بێ لایەن:
*( an ~ person, policy, treatment)*
**impartiality** (im-pär′shi-al′ə-ti), *n.* بێ لایەنی
**impassable** (im-pas′ə-b'l), *adj.* نابڕدرێت (ڕێگا، ڕوبار، شاخ)؛
پیا ڕۆیشتنی زۆر گرانە: *( an ~ highway, mountain, swamp)*
**-impassability** *(n.)*.
**impasse** (im′pas, im-pas′), *n.* (١) کوێرەکۆڵان؛ کۆڵانی دەرنەچوو.
(٢) تەنگوچەڵەمە؛ گیروگرفتی بێ چارە؛ گیرخواردن؛ چەقین:
*( The negotiations have reached an ~ .)*
**impassible** (im-pas′ə-b'l), *adj.* (١) هەست بە ئازار نەکەر.
(٢) کار تێ نەکراو؛ زیانی لێ نادرێ؛ پارێزراو. (٣) بێ هەست؛ هەست مردوو.
**-impassibility** *(n.)*; **impassibly** *(adv.)*.
**impassion** (im-pash′ən), *v.t.* هەست جوولاندن؛ هێنانەجۆش.
**impassioned** (im-pash′ənd), *adj.* بەجۆش؛ گەرم؛ بەهەست:
*( He gave an ~ speech.)*
**impassive** (im-pas′iv), *adj.* (١) هەست مردوو؛ هەست براو؛
هەست نەبزۆك؛ بێ هەست. (٢) هیچ کاری تێ ناکات؛ پارێزراو.
(٣) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ بێ دەنگ.
**-impassivity** *(n.)*.
**impatience** (im-pā′shəns), *n.* بێ ئارامی؛ ئارام نەگرتن؛
خۆ بۆ نەگیران؛ دان بە خۆدا نەگرتن.
**impatient** (im-pā′shənt), *adj.* بێ ئارام؛ ئارام نەگر؛ خۆ بۆ نەگیراو؛
دان بە خۆدا نەگر؛ بێ سەبر
**impeach** (im-pēch′), *v.t.* (١) لەکەدارکردن؛ بەدرۆخستنەوە؛
لێ کەم کردنەوە؛ شکاندن. (٢) گومانبار یا تاوانبارکردن و دان بە دادگای
تایبەتی (کاربەدەستی بەرز): *( to ~ the president)*.
**-impeachable** *(adj.)*; **impeachment** *(n.)*.
**impeccable** (im-pek′ə-b'l), *adj.* (١) بێ کەموکووڕی؛ بێ هەڵە؛
زۆرباش (شت)؛ تەواو: *( an ~ piece of work.)*
(٢) بێگەرد؛ بێ لەکە؛ پاك (ڕەووشت)؛ داوێن پاك:
*( He is a man of ~ character, record, etc.)*
**-impeccability** *(n.)*; **impeccably** *(adv.)*.
**impecunious** (im′pi-kū′ni-əs), *adj.* هەژار؛ مایەپووچ؛ نابووت؛
بێ پارە؛ بێ دەرامەت
**-impecuniousity** *(n.)*; **impecuniousness** *(n.)*.
**impede** (im-pēd′), *v.t.* ڕێ لێگرتن؛ دواخستن؛ وەستاندن؛
تەگەرەلێدان؛ کۆسپ دانان لە ڕێگەدا: *( to ~ the progress of a plan)*
**impediment** (im-ped′ə-mənt), *n.* (١) ڕێ لێگرتن؛ ڕێ لێ گیران؛
وەستان. (٢) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ؛ قۆرت؛ بەربەست؛ تەگەرە.
(٣) لاڵی: *( a speech ~ )*.
**impel** (im-pel′), *v.t.* (١) پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە
(٢) زۆرلێکردن؛ والێکردن؛ هاندان.
**impend** (im-pend′), *v.i.* (١) هەڕەشەلێکردن؛ بە سەر سەرەوە بوون
(مەترسی). (٢) خەریکی ڕوودان بوون (کارەسات)؛ نزیکی ڕوودان بوون:
*( an ~ing disaster)*
(٣) [Archaic]، شۆڕبوونەوە بەسەردا.
**impendent** (im-pen′dənt), *adj.* = **impending.**
**impending** (im-pen′diŋ), *adj.* خەریکی ڕوودانە؛
نزیك (کاتی ڕوودان): *( an ~ storm; ~ dangers)*
**impenetrable** (im-pen′i-trə-b'l), *adj.* (١) کون ناکرێ؛

کوناودەر ناکرێ؛ سەخت. (٢) تێگەیشتنی بۆ نییە؛ سەری لێ دەرناکرێ؛
بۆی لێك نادرێتەوە. (٣) کاری تێ ناکرێ؛ نەگۆڕ؛ سەرسەخت؛ هەست مردوو.
(٤) هاوجێ نابێ لەگەڵ شتێکی تردا (فیزیا).

**-impenetrability** *(n.)*; **impenetrably** *(adv.)*.

**impenitent** (im-pen′i-tənt), *adj.* ناپەشیمان

**-impenitence** *(n.)*.

**imperative** (im-per′ə-tiv), *adj.* (١) فەرمانی؛ فەرمان؛ وەك فەرمان:
*( an ~ gesture)*
(٢) زۆر پێویست؛ پێویست. *( It is ~ that I go at once.)*.
(٣) فەرمانی (ڕێزمان): تایبەتی بە باری فەرمانی کردار: *( the ~ mood)*.
*n.* (١) فەرمان؛ فەرمووده؛ فەرمایشت
(٢) (ا) باری فەرمانی کردار (ڕێزمان). (ب) کردارێکی فەرمانی.

**imperator** (im′pə-rā′tēr, im′pə-rā′tôr), *n.* (١) سەرکردەی
هەرە بەرزی سوپای ڕۆمای کۆن. (٢) ئیمپراتۆر.

**imperceptible** (im′pēr-sep′tə-b′l), *adj.* هەست پێ نەکراو؛
ئەوەندە کەمە هەستی پێ ناکرێ *( ~ changes, differences, etc.)*.

**-imperceptibility** *(n.)*; **imperceptibleness** *(n.)*;
**imperceptibly** *(adv.)*.

**imperceptive** (im′pēr-sep′tiv), *adj.* بێ سەرنج؛ ووردنەبین؛
نابەدی؛ ڕێ بەدیی نەکەر

**-imperceptiveness** *(n.)*.

**imperfect** (im-pūr′fikt), *adj.* (١) ناتەواو؛ کەموکورت؛ کەموکووڕ
(٢) تایبەتی بە کرداری ڕابوردووی ناتەواو، بەردەوام، یا پێشەیی (ڕێزمان).
*n.* (١) باری کرداری ڕابوردووی ناتەواو، بەردەوام، یا پێشەیی (ڕێزمان).
(٢) کردارێکی ئەم بارە.

**imperfection** (im′pēr-fek′shən), *n.* (١) ناتەواوی
(٢) کەموکورتی؛ کەموکووڕی؛ ناتەواوییەك؛ گەرد؛ لەکە.

**imperforate** (im-pūr′fēr-it), *adj.* (١) کون نەکراو؛ بێ کون
(تونکاری) (٢) قەراغەکەی سافەو گرنج گرنج نییە *( an ~ stamp)*.
*n.* پوولێکی قەراغ ساف

**-imperforated** (adj.); **imperforation** *(n.)*.

**imperial** (im-pēr′i-əl), *adj.* (١) تایبەتی بە ئیمپراتۆرنشین یا
شاهەنشانشین (٢) داگیرکەری؛ ئیمپریالیزمی؛ ئیستیعماری
(٣) تایبەتی بە ئیمپراتۆر یا شاهەنشا. (٤) دیکتاتۆری؛ دەسەڵاتی ڕەهایی.
(٥) بەشکۆ؛ شکۆدار؛ بە سام. (٦) گەورەوباش؛ نایاب.
(٧) تایبەتی بە کێشانەو پێوانەی ئینگلیزی.
*n.* (١) (ا) لایەنگرێکی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پیرۆز
(ب) سەربازێکی ئەم ئیمپراتۆرە (٢) پارەیەکی زێڕی ئیمپراتۆرنشینی ڕوسیا.
(٣) (ا) سەربانی عەرەبانە (ب) جانتای لەسەر ئەم سەربانە دانراو.
(٤) شتێکی گەورە یا نایاب (گەلێك جار ناوی بازرگانی ئەم شتەیە).
(٥) تەبەقە کاغەزی زل. (٦) چەناگە ڕیش؛ بزنە ڕیش.

**imperialism** (im-pēr′i-əl-iz′m), *n.* ئیمپریالیزم؛ داگیرکەری؛
داگیرکردن؛ ئیستیعمار

**imperialist** (im-pēr′i-əl-ist), *n.* (١) سەر بە ئیمپراتۆر؛
لایەنگری شاهەنشا؛ شاهەنشاخواز.
(٢) داگیرکەر؛ ئیمپریالیزم خواز؛ ئیمپریالیست
*n.* ئیمپریالیستی؛ داگیرکەری

**imperialistic** (im-pēr′i-əl-is′tik), *adj.* داگیرکەری؛
ئیمپریالیستی؛ ئیمپریالیزم خوازی.

**-imperialistically** *(adv.)*.

**imperil** (im-per′əl), *v.t.* خستنە مەترسییەوە

**imperious** (im-pēr′i-əs), *adj.* (١) لووت بەرز؛ بەفیز؛ لەخۆبایی؛
دیکتاتۆری؛ زۆردار؛ بەزەبر (٢) زۆر پێویست؛ ناتوانرێ بخرێتە پشت گوێ.

**imperishable** (im-per′ish-ə-b′l), *adj.* (١) نافەوتێ؛ نابڕێ؛
ناگەنێ (٢) نەمر؛ هەر دەمێنێ

**-imperishability** *(n.)*.

**imperium** (im-pēr′i-əm), *n.* (١) دەسەڵاتی ڕەهایی یا بێ سنوور.
(٢) شاهەنشانشین؛ ئیمپراتۆرنشین. (٣) دەسەڵاتی میری؛ مافی زۆرکاری یا
زەبر بەکارهێنانی میری بۆ دابینکردنی خەڵك.

**impermanent** (im-pūr′mə-nənt), *adj.* ساتی؛ کاتی؛ سەردەمی؛
ناهەمیشەیی؛ زوو بەسەرچوو.

**impermeable** (im-pūr′mi-ə-b′l), *adj.* (١) کون ناکرێ
(٢) ئاوی پیا ناڕوات؛ ڕێی ئاو یا شلە نادات پیا بڕوات.

**-impermeability** *(n.)*.

**impermissible** (im′pēr-mis′ə-b′l), *adj.* قەدەغە؛ ڕێ نەدراو؛
یاساغ.

**impersonal** (im-pūr′s′n-əl), *adj.* (١) کەس نەناس؛ سارد؛
بێ هەست: *( an ~ attitude)*.
(٢) لە کەسی بەدەر؛ لە مرۆڤ بەدەر: *( Time is an ~ force.)*.
(٣) تایبەتی نییە بە کەس وەك ووشەی " it " لەم ڕستەیەدا (ڕێزمان):
*( It is snowing.)*
*n.* (١) شتێکی لە مرۆڤ بەدەر.
(٢) کردارێکی نا تایبەتییە بە کەس (ڕێزمان) (ژمارە سێ بیینە).

**-impersonality** *(n.)*; **impersonally** *(adv.)*;
**impersonalize** *(v.t.)*.

**impersonate** (im-pūr′sə-nāt′), *v.t.* (١) نوێنەری کردن:
*( He ~s the spirit of the people.)*
(٢) خۆ کردن بە کەسێکی تر؛ خۆ وەك کەسێکی تر لێکردن؛ لاسایی کردنەوە
*( He can ~ anybody.)*

**-impersonator** *(n.)*.

**impersonation** (im′pēr-sə-nā′shən), *n.* (١) خۆ کردن بە
کەسێکی تر؛ خۆنوواندن وەك کەسێکی تر؛ لاسایی کردنەوە.
(٢) نوێنەرێتی؛ نوێنەرێتی کردن

**impertinence** (im-pūr′t′n-əns), *n.* (١) بێ پەیوەندی؛
پەیوەندی نەبوون بە باسەوە؛ لە باس لادان.
(٢) نەگونجان؛ نەشیان؛ نابەجێیی؛ بێ جێیی.
(٣) بێ حەیایی؛ ڕووکراوەیی؛ بێ ڕەووشتی.
(٤) کردەوەیەك یا تێبینییەك کە وەك یەکێك لەم سێ خاڵەی پێشوو بێت.

**impertinency** (im-pūr′t′n-ən-si), *n.* = **impertinence.**

**impertinent** (im-pūr′t′n-ənt), *adj.* (١) بێ پەیوەندی بە باسەوە؛
لە باس لادەر؛ بێ مانا. (٢) نابەجێ؛ نەشیاو؛ نەگونجاو.
(٣) بێ حەیا؛ بێ شەرم؛ ڕوو زۆر کراوە؛ بێ ڕەووشت.

**imperturbable** (im′pēr-tūr′bə-b′l), *adj.* هێمن؛ بە ئاسانی
هەڵناچێ؛ بێ هەست؛ هیچ کار تێ نەکردوو؛ ئاسوودەیی تێك نادرێ

**-imperturbability** *(n.)*; **imperturbably** *(adv.)*;
**imperturbation** *(n.)*.

**imperviable** (im-pūr′vi-ə-b′l), *adj.* = **impervious.**

**impervious** (im-pūr′vi-əs), *adj.* (١) هیچی پیا ناچێ؛
هیچی پیا ناڕوات؛ دژ بە؛ بەرهەڵستیکەر؛ تورت؛ پتەو:
*( fabric ~ to moisture)*
(٢) (ا) هیچ کاری تێ ناکات؛ هەست نەجووڵاو:
*( He was ~ to her tears.)*
(ب) گوێ لە هیچ ناگرێ؛ سەرسەخت: *( He is ~ to reason.)*.

**-imperviously** *(adv.)*; **imperviousness** *(n.)*.

**impetuous** (im-pech′ōō-əs), *adj.* (١) زۆر قایم؛ زۆر بەهێزو خێرا:
*( ~ winds)*
(٢) هەڵەشە؛ پرکێش: *( an ~ person)*.

**-impetuosity** *(n.)*.

**impetus** (im′pə-təs), *n.* (١) گوژم؛ تین؛ هێز.
(٢) پاڵ پێوەنەر؛ پاڵنەر؛ هاندەر؛ هانەهانە.

**impiety** (im-pī'ə-ti), *n.* (١) (أ) له خودا نه‌ترسان؛ بێ ئاینی؛ کافری.
(ب) بێ ڕێزی؛ ڕێز نه‌گرتن له شت و که‌سانی به‌ڕێز
(٢) کفر کردار، یا کرده‌وه‌ی له خوا نه‌ترسانه.
**impinge** (im-pinj'), *v.t.* ( ~ **on**; ~ **upon**; ~ **against**), (١) لێدان؛
پیادان؛ به‌یه‌کتریدادان؛ له‌یه‌کدان.
(٢) ده‌ستدرێژکردنه سه‌ر مافی خه‌ڵك: ***( to ~ on the rights of others)*** .
**-impingement** *(n.)*.
**impious** (im'pi-əs), *adj.* (١) له خودا نه‌ترس؛ بێ ئاین؛ کافر.
(٢) ڕێز نه‌گرتوو؛ بێ ڕێز.
**impish** (imp'ish), *adj.* که‌تنچی؛ به گۆبه‌ن.
**implacable** (im-plā'kə-b'l), *adj.* (١) بێ ئامان؛
به هیچ دڵی نه‌رم نابێ؛ ڕق ئه‌ستوور؛ لێبووردنی بۆ نی‌یه:
***( an ~ enemy, hatred, etc.)***
(٢) هیچ کاری تێ ناکات؛ نه‌گۆڕ؛ سه‌رسه‌خت؛ که‌م ناکرێته‌وه.
**-implacability** *(n.)*; **implacably** *(adv.)*.
**implant** (im-plant', im-plänt'), *v.t.* (١) ناشتن؛ تیا چه‌سپ کردن؛
چه‌سپاندن. (٢) چه‌سپاندن له مێشکدا؛ خستنه مێشکه‌وه؛ گۆش کردن.
(٣) موتوربه‌کردن (پزیشکه‌وانی).
***n.*** شانه، ئه‌ندام، یا به‌شێکی موتوربه‌کراو (پزیشکه‌وانی).
**-implantation** *(n.)*.
**implausible** (im-plô'zə-b'l), *adj.* بۆی نی‌یه؛ له‌وانه نی‌یه؛
نابێ؛ ناچێته مێشکه‌وه؛ ڕێی تێ ناچێ: ***( an ~ story)*** .
**-implausibility** *(n.)*; **implausibleness** *(n.)*;
**implausibly** *(adv.)*.
**implement** (im'plə-mənt), *n.* ئامێر؛ پێکار؛ هۆ.
***v.t.*** (١) ئیش پێکردن (یاسا، په‌یڕه‌و)؛ خستنه‌کار؛ جێبه‌جێکردن؛ به‌جێهێنان:
***( to ~ a law)***
(٢) ئامێر پێدان
**implementation** (im'plə-men-tā'shən), *n.* خستنه‌کار (یاسا،
په‌یڕه‌و)؛ ئیش پێکردن؛ په‌یڕه‌وکردن؛ به‌جێهێنان؛ جێبه‌جێکردن:
***( The ~ of the new law is our goal.)***
**implicate** (im'pli-kāt'), *v.t.* (١) ئاڵۆسکاندن؛ له‌یه‌که‌وه ئاڵاندن؛
له یه‌ك هه‌ڵکێشان. (٢) وا گه‌یاندن؛ ئه‌و مانایه دان یا به‌خشین.
(٣) تووش کردن؛ تێوه‌گلان؛ پێوه‌کردن (تاوانباری)؛ هێنان به‌سه‌ردا.
**implication** (im'pli-kā'shən), *n.* (١) تووش کردن؛ تووش بوون؛
تێوه‌گلان. (٢) وا گه‌یاندن؛ وا گه‌یێنراو.
(٣) مانا؛ نیشانه؛ ئه‌نجام ***( What are the ~s of his remarks?)*** .
**implicit** (im-plis'it), *adj.* (١) ئاڵۆسکاو؛ له‌یه‌که‌وه ئاڵاو.
(٢) ناڕاسته‌وخۆ؛ نادیار؛ شاراوه؛ به تونکڵ (مانا، ووته):
***( His anger was ~ . ; ~ consent)***
(٣) ناوه‌کی؛ تیایه‌تی؛ به‌شێکی سروشتی‌یه له:
***( Suspicion is ~ in such a tone of voice.)***
(٤) ته‌واو؛ بێ پایان: ***( Her trust in him was ~ . )*** .
**-implicitly** *(adv.)*; **implicitness** *(n.)*.
**implied** (im-plīd'), *adj.* ناڕاسته‌وخۆ (مانا)؛ شاراوه؛ نادیار؛
نائاشکرا.
**implode** (im-plōd'), *v.t. & v.i.* (١) ته‌قینه‌وه بۆ ناوه‌وه؛
ته‌قینه‌وه به‌ناوخۆدا؛ هه‌ره‌س دان به‌سه‌ر یا به‌ناوخۆدا.
(٢) بێژانی تیپێك به هه‌ناسه وه‌ستان (وه‌ك **p, t, k** ).
**implore** (im-plôr', im-plōr'), *v.t.* پاڕانه‌وه؛ لێ پاڕانه‌وه؛
تکالێکردن؛ داوالێکردن؛ دامێن گرتن.
**implosion** (im-plō'zhən), *n.* (١) ته‌قینه‌وه بۆ ناوه‌وه؛
ته‌قینه‌وه به‌ناوخۆدا؛ هه‌ره‌س بردن به‌ناوخۆدا.
(٢) هه‌ناسه بڕین له بێژانی هه‌ندێ تیپدا (وه‌ك **p, t, k** ).
**implosive** (im-plō'siv), *adj.* به هه‌ناسه بڕین ده‌بێژرێ وه‌ك تیپی
( **p, t, k** ).
***n.*** تیپێك که به هه‌ناسه بڕین ده‌بێژرێ (ده‌نگناسی).
**imply** (im-plī'), *v.t.* (١) به‌شێك بوون له؛ تێدابوون:
***( Drama ~ies conflict.)***
(٢) وا گه‌یاندن؛ ئه‌و مانایه به‌خشین: ***( His attitude ~ied boredom.)*** .
(٣) [Obs.]، ئاڵۆسکان؛ تێکه‌وه‌ئاڵاندن.
**impolite** (im'pə-līt'), *adj.* بێ ڕه‌ووشت؛ بێ ئه‌زاکه‌ت؛
ناشرین (ڕه‌فتار).
**-impolitely** *(adv.)*; **impoliteness** *(n.)*.
**imponderable** (im-pon'dēr-ə-b'l), *adj.* (١) زۆر سووك؛
بێ سه‌نگ؛ ناتوانرێ بکێشرێ؛ ناتوانرێ بپێورێ. (٢) ناتوانرێ هه‌ڵبسه‌نگێنرێ.
***n.*** شتێك که ناتوانرێ بکێشرێ یا بپێورێ؛ شتێك که ناتوانرێ هه‌ڵبسه‌نگێنرێ
**-imponderability** *(n.)*.
**import** (im-pôrt', im'pōrt), *v.t.* (١) هێنان له ده‌ره‌وه‌ی وولاته‌وه
(شتوومه‌ك، بیروباوه‌ڕ). (٢) وا گه‌یاندن؛ نیشانه‌ی ئه‌وه‌بوون؛ ئه‌نجام به‌خشین:
***( This action ~s trouble.)***
(٣) گرنگ بوون بۆ؛ به‌لاوه گرنگ بوون.
***v.i.*** گرنگ بوون بۆ؛ به‌لاوه گرنگ بوون؛ گرنگ بوون.
***n.*** (١) (أ) له ده‌ره‌وه‌ی وولاته‌وه هێنان؛ له ده‌ره‌وه هێنان.
(ب) بازرگانی شتوومه‌ك له ده‌ره‌وه‌ی وولاته‌وه هێنان.
(٢) هاورده؛ شتوومه‌کی له ده‌ره‌وه هێنراو.
(٣) مانا؛ نیشانه: ***( the ~ of his statement)*** .
(٤) گرنگی.
**-importable** *(adj.)*.
**importance** (im-pôr't'ns), *n.* (١) گرنگی؛ گرنگێتی؛ بایه‌خ.
(٢) پله‌وپایه. (٣) [Obs.]، شتێکی گرنگ. (٤) [Obs.]، مانا؛ نیشانه
**important** (im-pôr't'nt), *adj.* (١) گرنگ؛ به بایه‌خ؛ بایه‌خدار.
(٢) به‌ده‌سه‌ڵات؛ به پله‌وپایه. (٣) [Obs.]، سوور له‌سه‌ر؛ کۆڵنه‌ده‌ر.
**importation** (im'pôr-tā'shən), *n.* (١) شتومه‌ك له ده‌ره‌وه‌ی
وولاته‌وه هێنان؛ بازرگانی له ده‌ره‌وه شت هێنان.
(٢) هاورده؛ شتی له ده‌ره‌وه هێنراو.
**importer** (im-pôr'tẽr, im-pōr'tēr), *n.* بازرگانێك که شتوومه‌ك
له ده‌ره‌وه‌ی وولاته‌وه ده‌هێنێ؛ بهێن.
**importunate** (im-pôr'chə-nit), *adj.* (١) سوور له‌سه‌ر داوا؛
کۆڵنه‌ده‌ر له داوا: ***( an ~ beggar)*** .
(٢) [Obs.]، په‌ستکه‌ر؛ بۆژه‌که‌ر.
**importune** (im'pôr-tōōn', im'pôr-tūn'), *v.t.* (١) په‌ستکردن
به داواکردن و وازنه‌هێنان؛ داواکردنی په‌یتاپه‌یتا و کۆڵ نه‌دان؛ به‌زۆر داوالێکردن؛
بۆڕۆکردن. (٢) [Obs.]، (ا) په‌ست کردن؛ بێزارکردن. (ب) زۆر لێ کردن.
***adj.*** **importunate.**
**importunity** (im'pôr-tōō'nə-ti, im'pôr-tū'nə-ti), *n.* (١)-
(ا) داوالێکردنی په‌یتاپه‌یتا و واز لێ نه‌هێنان؛ به‌زۆر داوالێکردن.
(ب) په‌ستکردن؛ بێزارکردن.
(٢) (*pl.*) داوای په‌یتاپه‌یتا؛ داوای به‌زۆر؛ زۆرکاری؛ زۆر.
**impose** (im-pōz'), *v.t.* (١) به‌سه‌ردا دان (ئه‌رك، باج)؛ له‌سه‌ر دانان یا
بۆ بڕینه‌وه (سزا، باج):
***( The government ~s taxes on the people.)***
(٢) خۆ به‌سه‌ردا سه‌پاندن؛ خۆ به‌زۆر دان به‌سه‌ر خه‌ڵکدا؛
خۆ سه‌پاندن به‌سه‌ر خه‌ڵکدا:
***( You shouldn't ~ yourself on others.;***
***I don't want to ~ on you, but I appreciate your help.)***
(٣) به‌سه‌ردا سه‌پاندن (به‌تایبه‌تی به فڕوفێڵ):
***( He ~d his doctrines upon the confused nation.)***
(٤) ڕێکخستنی په‌ڕه بۆ چاپ کردن.
(٥) [Archaic]، دانان؛ خستنه‌سه‌ر.

*v.i.* بەکارهێنان بۆ سوودو ئامانجی نابەجێی خۆ (مرۆڤ، شت).
**impose on (or upon),** (١) بەکارهێنان بۆ سوودو ئامانجی خۆ؛ خۆ بەسەردا سەپاندن (٢) خەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن؛ دەسبڕین؛ ساختەلێکردن.
**imposing** (im-pōz′iŋ), *adj.* بەشکۆ؛ بە سام؛ سامدار؛ بە سەرو سیما
**imposition** (im′pə-zish′ən), *n.* (١) خۆ بەسەردا سەپاندن؛ بەزۆر خۆ دان بەسەر خەڵکدا.
(٢) بەکارهێنان بۆ سوودو ئامانجی ناڕەوای خۆ
*( It is an ~ to ask him to help.)*
(٣) دەستی پیرۆزبایی خستنەسەر سەر (ئاین).
(٤) (ا) باج؛ پێ بژاردن. (ب) ئەرك؛ ئەرکی ناڕەوا.
(٥) ساختە؛ دەسبڕین.
**impossibility** (im-pos′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) بۆ نەبوون؛ لەوانە نەبوونی ڕوودانێك یا شتێك؛ ڕێ تێ نەچوون؛ نەچوونە مێشکەوە (لەبەر نابەحێیی). (٢) کاری نەکراو؛ کار یا شتی ڕێ تێ نەچوو.
**impossible** (im-pos′ə-b'l), *adj.* (١) نابێ؛ هەر نابێ؛ ڕێی تێ ناچێ؛ لەوانە نییە؛ ناچێتە مێشکەوە (لەبەر نابەجێیی)؛ ناشێ؛ بۆی نییە (٢) [Colloq.]، (ا) لەگەڵیدا دەرنابڕێ؛ لەگەڵیدا هەڵناکرێ؛ ناپەسەند *( an ~ person)*.
(ب) ناپەسەند؛ ناخۆش؛ پڕ گیروگرفت: *( an ~ situation)*.
**impost** (im′pōst), *n.* باج؛ باجی گوومرگ (لەسەر شتوومەکی لە دەرەوە هێنراو)؛ گوومرگ
*v.t.* پۆل پۆل کردنی شتوومەکی لە دەرەوە هێنراو بۆ باجی گوومرگ لەسەر دانان
**impost** (im′pōst), *n.* بەشی لاسەرووی کۆڵەکە یا پایەیەك کە تاقێکی لەسەر ڕاگیر بووە.
**impostor** (im-pōs′tẽr), *n.* ساختەچی؛ بە درۆ خۆنوێنەر.
**imposture** (im-pōs′chẽr), *n.* ساختە؛ ساختەچێتی؛ بە درۆ خۆنوواندن
**impotence** (im′pə-təns), *n.* (١) بێ هێزی؛ لاوازی؛ بێ توانایی.
(٢) دەستەپاچەیی؛ بێ دەسەڵاتی؛ هیچ لەبارا نەبوون.
(٣) لە پیاوەتی کەوتن.
**impotency** (im′pə-tən-si), *n.* = impotence.
**impotent** (im′pə-tənt), *adj.* (١) بێ هێز؛ لاواز؛ بێ توانا؛ بێ تین.
(٢) دەستەپاچە؛ بێ دەسەڵات؛ هیچ لەبارا نەبوو. (٣) لە پیاوەتی کەوتوو.
**impound** (im-pound′), *v.t.* (١) کردنە کولانە، تەویلە، یا پەچەوە؛ خستنە ژوورەوە؛ بەستنەوە. (٢) گرتن؛ خستنە زیندانەوە؛ خستنە بەندیخانە.
(٣) ئاو کۆکردنەوە لە ئەستێڵ یا عەماراودا
-impoundment *(n.)*.
**impoverish** (im-pov′ẽr-ish), *v.t.* (١) هەژارکردن؛ بێ دەرامەت کردن؛ بێ پارە کردن. (٢) هێز لێ بڕین؛ بێ هێز کردن؛ بێ پیت کردن.
-impoverishment *(n.)*.
**impracticable** (im-prak′ti-kə-b'l), *adj.* (١) ناکردەنی؛ بەکار ناهێنرێ؛ کاری پێ ناکرێ؛ پەیڕەوی ناکرێ: *( an ~ plan)*.
(٢) نابڕێ (ڕێگە)؛ کەس ناتوانێ پیایا بڕوات: *( an ~ road)*.
(٣) دابین ناکرێ؛ سەرکێش؛ کەللەڕەق: *( an ~ person)*.
-impracticability *(n.)*.
**impractical** (im-prak′ti-k'l), *adj.* (١) ناکردەنی؛ بەکار ناهێنرێت؛ جێبەجێ ناکرێت *( an ~ idea)*.
(٢) ناکردەنی (مرۆڤ)؛ نەشارەزای کاروباری ژیان؛ خەیاڵ پەرست:
*( an ~ person)*
-impracticality *(n.)*; impracticalness *(n.)*.
**imprecate** (im′pri-kāt′), *v.t.* لەعنەت لێکردن؛ دزعا لێکردن
-imprecator *(n.)*.
**imprecation** (im′pri-kā′shən), *n.* (١) لەعنەت لێکردن؛ دزعا لێکردن. (٢) لەعنەت؛ دزعا؛ نزای خراپ.
**impregnable** (im-preg′nə-b'l), *adj.* (١) کون ناکرێ؛ ناگیرێ (شوێن)؛ سەخت (قەڵا، شوێن)؛ داگیر ناکرێ؛ قایم:
*( an ~ castle, house, etc.)*
(٢) پتەو؛ چەسپیو (بیروباوەڕ، ناوبانگ)؛ ڕەگ داکوتاو: *( an ~ belief)*.
-impregnability *(n.)*; impregnably *(adv.)*.
**impregnable** (im-preg′nə-b'l), *adj.* سکی پڕ دەکرێت.
**impregnate** (im-preg′nāt), *v.t.* (١) پیت کردن؛ لێکدانی تۆوی نێرو هێلکەی مێ (٢) سکپڕکردن.
(٣) پەین تێکردن؛ پەین ڕێژ کردن؛ بەهێزکردنی زەوی بە پەین تێکردن.
(٤) پڕکردن؛ تێ هەڵکێشان:
*( They ~d their clothing with insecticide.)*
(٥) مێشك پڕکردن.
*adj.* (١) سکپڕکراو؛ سکپڕ. (٢) پڕ؛ پڕکراو.
-impregnation *(n.)*; impregantor *(n.)*.
**impresario** (im′pri-sä′ri-ō′), *n.* بەڕێوەبەری تیپ یا دەستەی ئۆپەرا، باڵێ، یا مۆسیقا؛ سەرتیپ؛ ڕێکخەر.
**impress** (im-pres′), *v.t.* (١) گرتن بە سەرباز؛ بەزۆرگرتن بە سەرباز.
(٢) دەستبەسەراگرتن (سامان، زەوی‌وزار).
*n.* = impressment.
**impress** (im-pres′), *v.t.* (١) نیشان کردن؛ مۆرکردن؛ لەسەر هەڵکۆڵین؛ مۆر لەسەر هەڵکەندن (٢) کارکردنەسەر (مێشك، هەست)؛ کارتێکردن؛ هەست جووڵاندن؛ بەدڵداچوون:
*( The place ~ed him very much.; He ~ed his audience.)*
(٣) خستنە مێشکەوە؛ لە مێشك‌و یادا چەسپاندن
*n.* (١) (ا) نیشان کردن؛ مۆرکردن؛ مۆر لەسەر هەڵکەندن.
(ب) کارکردنەسەر؛ هەست جووڵاندن. (ج) خستنە مێشکەوە.
(٢) نیشان؛ نیشانە؛ مۆر. (٣) کاری سەر مێشك.
-impressibility *(n.)*; impressible *(adj.)*.
**impression** (im-presh′ən), *n.* (١) نیشان کردن؛ مۆرکردن؛ مۆر لەسەر هەڵکەندن؛ لەسەر هەڵکەندن. (٢) مۆر؛ نیشان؛ جێ نیشان؛ شوێن مۆر؛ جێ نیشانە. (٣) چۆنێتی هاتنە بەرچاو (شت، مرۆڤ، ڕووداو)؛ باری سەرنج؛ یادگاری لە مێشکدا درووست بوو؛ هەستی بەرامبەر بە کەسێك، شتێك، یا ڕووداوێك؛ کاری سەر مێشك‌و هەست:
*( His music makes little ~ on me.;*
*He made a good ~ on all of them.)*
(٤) وا تێگەیشتن؛ وا زانین؛ لاوابوون:
*( I have the ~ that he was there.)*
(٥) قاڵبی دان (ددانسازی)
(٦) (ا) چاپکردن. (ب) دانەیەکی چاپکراو.
(ج) سەرجەمی ژمارەی بە یەکجار چاپکراو (پەڕتووك).
**impressionable** (im-presh′ən-ə-b'l), *adj.* بە ئاسانی کاری تێ دەکرێت؛ بە ئاسانی بیرو هەستی دەگۆڕدرێت‌و کار لە ڕەووشتی دەکرێت:
*( Children are very ~ .; He is at an ~ age.)*
-impressionability *(n.)*; impressionableness *(n.)*.
**impressionism** (im-presh′ən-iz'm), *n.* شێوازو-بزووتنەوەیەکی نیگارکێشییە (هەروەها وێژەو مۆسیقاش) لە بەشی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا داهات‌و دەڵێت: کە هونەرمەند چۆن دیمەن‌و شت‌و ڕووداوی دێتە بەرچاو بۆ یەکەم جار دەبێت وەهایش بیگێڕێتەوە بۆ خەڵك‌و گوێ نەداتە ووردەکاری‌و ڕاست‌و دروێی ئەو وێنەیە کە هاتۆتە بەرچاوی‌و گونجانی لەگەڵ ڕاستی تەواوی شتەکەدا.
**impressionist** (im-presh′ən-ist), *n.* (١) هونەرمەندی- impressionism. (٢) لاساییکەرەوە.
-impressionistic *(adj.)*.
**impressive** (im-pres′iv), *adj.* سەرنج ڕاکێش؛ باش؛ بەشکۆ؛

پەسەند؛ کارتێکەر؛ کارکەرە سەر هەست و مێشك.

**impressment** (im-pres′mənt), *n.* (١) دەستبەسەراگرتنی زەوی و زارو سامان (٢) بەزۆر گرتن بە سەرباز

**imprest** (im′prest), *n.* قەرز یا پارەی پێشەکی لە دەزگایەکی میرییەوە بۆ فەرمانبەرێکی ئەو دەزگایە (بۆ جێبەجێکردنی فەرمانێکی رەسمی)

*adj.* قەرز؛ پارەی پێشەکی دراو وەك قەرز

**imprint** (im-print′), *v.t.* (١) لەسەر هەڵکەندن؛ مۆرکردن؛ نیشان کردن *( He ~ed the paper with his seal.)*

(٢) چاپکردن؛ وێنەی دەقاودەق دەرکردن بە چاپ

(٣) لەسەر نەخش کردن؛ کردن (ماچ)؛ لەسەرکردن:

*( She ~ed a kiss on my forehead.)*

(٤) خستنە مێشکەوە: لە مێشکدا چەسپ کردن؛ لەیادنەکردن:

*( to ~ something on the mind)*

*n.* (١) نیشان؛ مۆر؛ نەخشە یا جێ نەخشەی نەکوژاوە.

(٢) ئەنجامی لەبەرچاو؛ جێ نیشان؛ جێ نیشانە؛ ئەنجامی کارتێکردن؛ نیشانە *( the ~ of starvation; He left his ~ on his society.)*.

(٣) مۆری چاپکەر یا بلاوکەرەوە (کە بریتییە لە ناوی چاپکەرو کات و شوێنی چاپ کردنی پەرتووکێك کە لەسەر پەڕەی یەکەم چاپ دەکرێ).

**imprison** (im-priz′'n), *v.t.* (١) خستنە بەندیخانەوە؛ زیندانی کردن (٢) بەستنەوە

**imprisonment** (im-priz′'n-mənt), *n.* (١) خستنە بەندیخانە؛ خستنە زیندان (٢) بەستنەوە.

**improbability** (im′prob-ə-bil′ə-ti), *n.* (١) لەوانە نەبوونی ڕوودانی؛ ڕێ تێ نەچوون؛ بۆ نەبوون کە ڕووبدات.

(٢) شتێك کە لەوانە نەبێ ڕووبدات؛ کاری نەکرد

**improbable** (im-prob′ə-b'l), *adj.* لەوانە نییە ڕووبدات؛ نابێ؛ ڕێی تێ ناچێ ڕووبدات؛ بۆی نییە؛ ناچێتە مێشکەوە.

-**improbably** *(adv.)*.

**improbity** (im-prō′bə-ti), *n.* سەرچەوتی؛ چەوتی؛ ناپاکی

**impromptu** (im-promp′to͞o, im-promp′tū), *adj.* & *adv.* سەرپێیی؛ بەبێ خۆ بۆ ئامادەکردن و بیرلێکردنەوە پێشەکی؛ کوتوپڕی:

*( an ~ news conference)*

*n.* شتێك یا کردارێکی سەرپێیی؛ شتێك یا کردارێکی کراو بەبێ خۆ بۆ ئامادەکردن و بیرلێکردنەوە لە پێشەوە؛ شتێکی کوتوپڕی.

**improper** (im-prop′ēr), *adj.* (١) نەگونجاو؛ نەشیاو؛ نابەجێ؛ بێ جێ (٢) هەڵە؛ چەوت؛ نادروست: *( He uses ~ English.)*.

(٣) ناشرین (ڕەوشت)؛ بێ ڕەووشت؛ ناپەسەند؛ بەدڕەووشت؛ ناشایست:

*( ~ conduct, language, dress, etc.)*

**improper fraction,** کەرتی ناتەواو (بیرکاری).

**impropriety** (im′prə-prī′ə-ti), *n.* (١) نابەجێیی؛ بێ جێیی؛ نەشیاوی؛ نەگونجان؛ نەگونجاوی؛ ناشرینی (ڕەووشت).

(٢) کارێکی ناشرین یا نابەجێ؛ کردەوەیەکی بێ جێ یا ناشرین

(٣) بە هەڵە بەکارهێنانی ووشە.

**improve** (im-pro͞ov′), *v.t.* (١) سوود لێ وەرگرتن؛ کەڵك لێ وەرگرتن.

(٢) چاك کردن؛ باش کردن؛ چاکترکردن؛ پەرە پێ سەندن؛ پێشخستن.

(٣) بە نرختر کردن (زەوی و زار).

*v.i.* چاك بوون؛ چاکتر بوون؛ باشتر بوون؛ بەرەو باشی ڕۆیشتن؛ پەرەسەندن؛ پێشکەوتن

**improvement** (im-pro͞ov′mənt), *n.* (١) باشتر بوون؛ چاك کردن؛ پێشکەوتن؛ پێشخستن؛ پەرەسەندن. (٢) (ا) باشی؛ چاکی.

(ب) گۆڕینی بەرەو باشی؛ چاك کردنی زەوی و زارو خانوو.

**improvidence** (im-prov′ə-dəns), *n.* پاشەکەوت نەکردن بۆ دوارۆژ؛ پارە بەفیڕۆدان؛ دەستبلاوی؛ بێباکی

**improvident** (im-prov′ə-dənt), *adj.* دەستبلاو؛ پارە بەفیڕۆدەر؛ بە تەنگ دوارۆژەوە نەهات؛ پاشەکەوت نەکەر؛ بێباك

**improvisation** (im-prov′ə-zā′shən), *n.* (١) سەرپێیی؛ کردنی شتێك بەبێ خۆ ئامادەکردن و پێشەکی بیرلێکردنەوە؛ بە سەرپێیی کردن.

(٢) کارێکی سەرپێیی؛ کردارێکی بێ خۆ ئامادەکردن و بیرلێکردنەوە.

**improvisator** (im-prov′ə-zā′tēr), *n.* بکەری شتێك بێ خۆ ئامادەکردن و پێشەکی بیرلێکردنەوە

-**improvisatorial** *(adj.)*; **improvisatory** *(adj.)*.

**improvise** (im′prə-vīz′), *v.t. & v.i.* بە سەرپێییەوە کردن؛ کردنی شتێك بەبێ خۆ بۆ ئامادەکردن و بیرلێکردنەوە (گۆرانی، خۆنوواندن، شت دروستکردن).

-**improviser** *(n.)*.

**improvised** (im′prə-vīzd′), *adj.* سەرپێیی؛ بە سەرپێیی کراو؛ بەبێ خۆ بۆ ئامادەکردن و بیرلێکردنەوە کراوە

**imprudence** (im-pro͞o′d'ns), *n.* (١) هەڵەشەیی؛ نازیری؛ نابەجێیی؛ دوورنەبینی

(٢) کردەوە یا کردارێکی نازیرانە و هەڵەشانە

**imprudent** (im-pro͞o′d'nt), *adj.* نازیر؛ هەڵەشە؛ نادرووست؛ نابەجێ؛ دوورنەبین

**impudence** (im′pyoo-dəns), *n.* (١) بێ حەیایی؛ بێ ئابڕوویی؛ بێ شەرمی؛ ڕووقایمی (٢) کردەوەیەکی بێ شەرمانە یا بێ حەیایانە.

**impudency** (im′pyoo-dən-si), *n.* = **impudence**.

**impudent** (im′pyoo-dənt), *adj.* بێ ئابڕوو؛ بێ شەرم؛ بێ حەیا؛ ڕووقایم.

**impugn** (im-pūn′), *v.t.* هێرش بردنە سەر؛ ڕەخنەلێگرتن؛ بە درۆخستنەوە.

**impulse** (im′puls), *n.* (١) (ا) پاڵ پێوەنان؛ لەپڕ پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە. (ب) پاڵ؛ گوژم؛ پاڵێکی قایم و لەپڕ. (ج) جووڵانێك بەهۆی ئەم گوژمەوە. (٢) (ا) هاندان؛ هانەهان (ب) هەوەس؛ مەیل؛ هەوەس یا مەیلێکی لەپڕو بێ بیرلێکردنەوە؛ هەست.

**impulsion** (im-pul′shən), *n.* (١) پاڵ پێوەنان.

(٢) پاڵ؛ گوژم (٣) هەوەس؛ مەیل؛ هەوەس یا مەیلی کوتوپڕ.

**impulsive** (im-pul′siv), *adj.* (١) پاڵ پێوەنەر.

(٢) (ا) هەوەس پەرست؛ هەوەست خواز؛ پڕکێش *( an ~ person)*

(ب) ئەنجامی بیر لێ نەکردنەوە و هەوەس پەرستییە: *( an ~ remark, act)*

**impunity** (im-pū′nə-ti), *n.* لە سزا بەدەری؛ بەبێ سزادان؛ بە سەربەستی و بێ ترسی سزا؛ وەك بەرزەکی بانان بۆ دەرچوون.

*( They commit crimes with ~ . )*

**impure** (im-pyoor′), *adj.* (١) پیس؛ نا خاوێن؛ ناپاك و تەمیز.

(٢) گلاو (٣) بەدڕەووشت؛ ناپاك؛ داوێن پیس؛ ناپەسەند؛ پیس

(٤) ناپوخت؛ ناپوختە. (٥) تێکەلاو؛ هەمەچیزە.

(٦) هەڵە (لەڕووی زمان یا ڕێزمانەوە).

**impurity** (im-pyoor′ə-ti), *n.* (١) پیسی؛ نا خاوێنی؛ پیسیتی

(٢) ناپاکی؛ داوێن پیسی؛ بەدڕەووشتی.

(٣) ناپوختەیی؛ دووڕەگی؛ هەمەچیزەیی؛ تێکەلاوی.

(٤) هەڵە (زمان). (٥) شتێکی پیس، ناپاك، دەرەکی، یا ناپوختە.

**imputation** (im′pyoo-tā′shən), *n.* (١) تاوانبارکردن؛ گوناهبارکردن؛ تاوان دانەپاڵ (٢) لەکە؛ لکە؛ تاوان.

**impute** (im-pūt′), *v.t.* (١) تاوانبارکردن؛ گوناهبارکردن؛ تاوان دانەپاڵ؛ لەکەدارکردن؛ خستنە مل:

*( He was innocent of the crime ~d to him.)*

(٢) دانەپاڵ (مەجاز).

**in** (in), *prep.* (١) لەناو؛ لە: *( ~ the room; ~ the envelope)*.

(٢) لە: لەبەریدایە (جل): *( the lady ~ red)*

(٣) لە ماوەی؛ لە: *( It was done ~ a day.)*.

(٤) لەپاش؛ لەدوای: *( I'll be with you ~ an hour.)*.

(٥) هەستی پێ دەکرێ؛ لەبەرچاوە؛ دەبینرێ *( He is ~ sight.)*

(٦) له (له رای منداڵ به (به رای من): *( ~ my opinion)*
(٧) له (له پیشەیەکی تایبەتیدا کاردەکات): *( He is ~ business.)* .
(٨) له: له ناوەراست' له ناوچەق *( They were ~ a storm.)* .
(٩) له: له مەترسیدا بوون' مەترسی بوون: *( ~ trouble)*
(١٠) خەریك *( ~ a search for truth)*
(١١) له: لەو رووەوە' دەربارەی؛ لەرووی
*( weak ~ faith; They vary ~ size.)*
(١٢) بە :شێوە *( arranged ~ groups, rows, etc.)*
(١٣) بە :هۆ: *( He paints ~ oil; written ~ English)* .
(١٤) له' بە :ئەوە یا بەوە کراوە) *( It was done ~ wood.)* .
(١٥) له: لەتاو *( He cried ~ pain.)* .
(١٦) بۆ' لەبەر *( Do this ~ my defense.)* .
(١٧) تیابوون :ئازایی، توانا، غیرەت): *( He didn't have it ~ him.)* .
(١٨) ژوورەوە' ناوەوە: *( Come ~ the house.)*
*adv.* (١) بۆ ژوورەوە' بۆ ناوەوە؛ ژوورەوە' *( He went ~ )* .
(٢) خستنە پلەوپایە، شوێن، یا بارێکەوە *( Labor's vote put him ~ )* .
(٣) تیایدا *( Mix cream ~ the sauce.)*
(٤) لەگەڵ گونجان، نەگونجان): *( He fell ~ with our plans.)* .
*adj.* (١) بەدەست' بەدەسەڵات؛ شت بەدەست: *( the ~ group)* .
(٢) ناوەوە' ناوەکی
(٣) (أ) بۆ ناوەوە' هی چوونە ژوورەوە: *( the ~ door)* .
(ب) هاتوو' ئەوەی دەچێتە ژوورەوە: *( the ~ boat)*
(٤) [Colloq.] . له قازانجدایە: *( He is ~ a hundred dollars.)* .
(٥) بەباو' بەبرەو
*n.* (١) (کۆ) دەستە، حیزب، یا کۆمەڵی حوکمڕانیکەر' دەستەی لە سەرەوە.
(٢) [Colloq.]، کون' دەرگا؛ هۆی چوونەناو کۆمەڵ، یا دەستەیەکی
بەدەسەڵاتەوە (٣) [Colloq.]، دەسەڵات؛ دەست؛ خاتر گیران
*v.t.* (١) گردکردنەوە؛ کۆکردنەوە
(٢) دەورگرتن' خستنە ناوەوە؛ خستنە ژوورەوە.

**have it in for,** [Colloq.]. رِق لێ بوون' کینە هەڵگرتن؛
قین لێ بوونەوە *( to have it in for somebody)*

**in for,** تووشی ناخۆشی بوون

**in itself,** خۆی لە خۆیدا' لە خۆیدا

**in on,** [Colloq.]. ئاگا لێ بوون' بە ئاگا
*( He was in on the plan.)*

**ins and outs,** (١) پێچ وپەنا' شوێن، ڕێگە)؛ کون و قوژبن
(٢) پێچ وپەنا' کردار، کار؛ کون و قوژبن

**in that,** چونکە' لەبەرئەوەی

**in the name of,** بە ناوی

**in with,** دۆستێتی' بر ئەدرن' نزیکن' بەینیان نزیکە
*( He is in with her.)*

**in-** (in), پێشگرێکە بەمانای لەناو' لەناوەوە' ناوەکی: *( inbreed)*

**in-** (in), پێشگرێکە بەمانای بێ' نە: *( insignificant)* .
وە دەبێ بە -il لەپێش " l " دوە: *( illiterate)*
وە بە ir- لەپێش " r " دوە: *( irresponsible)*
وە بە im- لەپێش " m, p, b " دوە:
*( immaterial, impossible, imbecile)*

**-in** (in), پاشگرێکە بەمانای بە کۆمەکی کردن؛ پێکەوەکردن:
( sit-in, teach-in, kneel-in, etc.)

**inability** (in´ə-bil′ə-ti), *n.* نەتوانین' بێ توانایی؛ توانا نەبوون

**inaccessible** (in´ək-ses′ə-b'l), *adj.* (١) کەس ناینگاتێ
کەس ناتوانێ پێگاتێ یا بچێتە ناوی *( an ~ place, mountain, etc.)*
(٢) کەس ناتوانێ قسەی لەگەڵ بکات یا ببینێ؛ کەس دەمی نایگاتێ؛
کاری تێ ناکرێ' نابینرێ *( an ~ ruler, person, official, etc.)*
(٣) دەست ناکەوێ' دەستگیر نابێ
-inaccessibility *(n.)*; inaccessibly *(adv.)*.

**inaccuracy** (in-ak′yoo-rə-si), *n.* (١) ناتەواوی؛ ناڕاستی؛
ناووردی. (٢) هەڵە؛ شتێکی ناتەواو.

**inaccurate** (in-ak′yoo-rit), *adj.* ناتەواو؛ هەڵەدار؛ هەڵە؛ ناڕاست.

**inaction** (in-ak′shən), *n.* هیچ نەکردن؛ ناچالاکی؛ سستی؛ تەمەڵی؛
پاڵ لێ دانەوە.

**inactivate** (in-ak′tə-vāt´), *v.t.* (١) لە چالاکی خستن؛ دانیشاندن
(٢) هەڵوەشانەوە؛ ناشبەتاڵ پێکردن؛ لەکارخستن؛ دوایی پێ هێنان (دەزگای
میری، لقی لەشکر... هتد)

**inactive** (in-ak′tiv´), *adj.* (١) نەبزۆك؛ نەجووڵاو.
(٢) سست؛ تەمەڵ؛ خاو؛ ناچالاك' هیچ نەکەر؛ دانیشتوو.
(٣) (أ) پەککەوتە؛ لەکارکەوتوو. (ب) خانەنشین.
(٤) زۆر کار لە هیچ ناکاو کاری لێ ناکرێ (کیمیا).
(٥) خامۆش (نەخۆشی)؛ دامرکاوەتەوەو هیچ نیشانەی دیار نییە (نەخۆشی)
*( an ~ disease)*

**inactivity** (in´ak-tiv′ə-ti), *n.* ناچالاکی؛ هیچ نەکردن؛ دانیشتن؛
سستی؛ تەمەڵی؛ خاوی؛ خامۆشی؛ دامرکاوەیی.

**inadequacy** (in-ad′i-kwə-si), *n.* ناتەواوی؛ کەم وکووڕی؛
کەم وکورتی؛ کەمی.

**inadequate** (in-ad′i-kwit), *adj.* ناتەواو؛ کەم وکووڕ؛ کەم وکورت؛
کەم؛ بەش ناکات؛ بەس نییە؛ باش نییە.
-inadequately *(adv.)*.

**inadmissible** (in´əd-mis′ə-b'l), *adj.* قەدەغە؛ ڕێی نادرێ؛
نابێ؛ ڕێی لێ نادرێ: *( an ~ evidence, mistake, etc.)* .
-inadmissibility *(n.)*; inadmissibly *(adv.)*.

**inadvertence** (in´əd-vūr′t'ns), *n.* (١) گوێ ڕانەیەڵی؛ بێباکی؛
گوێ نەدان (٢) بێ دەسەنقەستی' ڕێکەوتی؛ هەڵەی بێ دەسەنقەست'
لەخۆوەیی

**inadvertency** (in´əd-vūr′t'n-si), *n.* = inadvertence.

**inadvertent** (in´əd-vūr′t'nt), *adj.* (١) گوێ ڕانەیەڵ؛ بێ گوێ؛
بێباك؛ گوێ پێ نەدەر. (٢) بێ دەسەنقەست؛ ڕێکەوت؛ بە هەڵە:
*( an ~ insult, mistake, etc.)*
-inadvertently *(adv.)*.

**inadvisable** (in´əd-vīz′ə-b'l), *adj.* نابەجێ؛ بێ جێ؛
وا باش نییە؛ ناژیرانە؛ نادرووست؛ ناپەسەند:
*( It is ~ to put all your eggs in one basket.)*
-inadvisability *(n.)*.

**inalienable** (in-āl′yən-ə-b'l), *adj.* ناسەنرێتەوەو نادرێ بە
یەکێکی تر؛ بۆی نییە کەس بیسەنێتەوە یا بیدات بە یەکێکی تر (ماف):
*( ~ rights)*
-inalienability *(n.)*; inalienably *(adv.)*.

**inalterable** (in-ôl′tēr-ə-b'l), *adj.* ناگۆڕدرێ؛ گۆڕینی بۆ نییە؛
نەگۆڕاو.
-inalterability *(n.)*; inalterably *(adv.)*.

**inane** (in-ān′), *adj.* (١) بۆش؛ بەتاڵ.
(٢) هیچ وپووچ؛ بێ مانا؛ منداڵانە؛ بێ مێشکانە: *( ~ conversation)*
-inanity *(n.)*.

**inanimate** (in-an′ə-mit), *adj.* (١) بێ ژین؛ بێ گیان:
*( A rock is an ~ object.)*
(٢) بێ گیان؛ بێ ڕۆح: *( ~ nature)* .
(٣) ووشك؛ بێ هەست؛ مردوو (مەجازی)؛ بێ تین؛ خاو:
*( ~ conversation)*

**inappeasable** (in´ə-pēz′ə-b'l), *adj.* دڵی نەرم نابێ؛
هیچ کاری تێ ناکاو ڕای پێ ناگۆڕێ؛ سەرسەخت.

**inappetence** (in-ap′ə-təns), *n.* حەز لە خواردن نەکردن؛

نارەزووی خواردن نەبوون یا نەکردن

**inapplicable** (in-ap′li-kə-b'l), *adj.* (١) نابگرێتەوە (یاسا) پەیڕەو. ***(The law is ~ in this case.)***
(٢) نەگونجان؛ نەشیاو؛ نابەجێ.

**-inapplicability** ***(n.).***

**inappreciable** (in′ə-prē′shi-ə-b'l, in′ə-prē′shə-b'l), ***adj.*** زۆر کەم؛ ئەوەندە کەمە هەستی پێ ناکرێ.

**inappreciative** (in′ə-prē′shi-ā′tiv), ***adj.*** بەدنمەك؛ نمەك کوێر؛ سپڵە؛ بێ سفەت

**inapprehensive** (in′ap-ri-hen′siv), ***adj.*** (١) تێ ناگات؛ ناتوانێ تێ بگات (٢) هەست بە مەترسی نەکەر.

**inapproachable** (in′ə-prōch′ə-b'l), ***adj.*** کەس ناتوانێ لێی نزیك بێتەوە؛ کەس ناتوانێ دەمی بیگاتێ یا قسەی لەگەڵدا بکات.

**inappropriate** (in′ə-prō′pri-it), ***adj.*** ناشرین (کردەوە، ڕەووشت)؛ نابەجێ؛ بێ جێ؛ نەشیاو؛ نەگونجاو.

**-inappropriately** ***(adv.)***; **inappropriateness** ***(n.).***

**inapt** (in-apt′), ***adj.*** (١) نەگونجاو؛ نەشیاو؛ نابەجێ
(٢) ناکارامە؛ هیچ لە بارا نەبوو؛ نەشارەزا؛ نەزان؛ نالەبار؛ نابەکار؛ دەسەپاچە.

**inaptitude** (in-ap′tə-tōōd′, in-ap′tə-tūd′), ***n.*** (١) نەشیانی؛ نابەجێیی؛ نەگونجان. (٢) ناکارامەیی؛ هیچ لە بارا نەبوون؛ نە شارەزایی؛ نەزانین؛ نالەباری؛ نابەکاری؛ دەسەپاچەیی.

**inarticulate** (in′är-tik′yoo-lit), ***adj.*** (١) کەس تێی ناگات؛ دەپرتێنرێ بەبێ ووشە: ***(~ cry)***
(٢) (ا) لاڵ؛ (ب) بێ دەموپل؛ زمان ناپاراو؛ ناتوانێ هەست و بیری خۆی باش دەربڕێ
(٣) دەرنەبڕراو؛ بە ووشە دەرنابڕرێ: ***(~ passion, pain, joy, etc.)***.
(٤) بێ جومگە (زیندەوەرناسی)

**inartificial** (in-är′tə-fish′'l), ***adj.*** (١) سرووشتی؛ نادەستکرد.
(٢) خاکی؛ سادە (٣) ناهونەری؛ نەزان

**inartistic** (in′är-tis′tik), ***adj.*** ناهونەری؛ ناهونەرانە؛ ناشرین.

**-inartistically** ***(adv.).***

**in-as-much** (in′əz-much′), ***conj.*** (١) چونکە؛ لەبەرئەوەی؛ لەبەرئەوە (٢) ئەوەندەی (پلە)؛ تا ئەو رادەیەی کە؛ هەتا.

**inattention** (in′ə-ten′shən), ***n.*** (١) بێ گوێیی؛ گوێ پێ نەدان؛ بێباکی؛ فەرامۆشی (٢) کار یا کردەوەیەکی بێ گوێ یانەو بێباکانە.

**inattentive** (in′ə-ten′tiv), ***adj.*** بێ گوێ؛ گوێ پێ نەدەر؛ گوێ پێ نەدەر؛ گوێ ڕانەیەڵ؛ بێباك

**-inattentiveness** ***(n.).***

**inaudible** (in-ô′də-b'l), ***adj.*** نابیستری؛ ئەوەندە هێواش و نزمە نابیستری

**-inaudibly** ***(adv.).***

**inaugural** (in-ô′gyoo-rəl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە ڕەنگ ڕشتن؛ بناغەدانان یا کردنەوەی پرۆژەیەك (٢) تایبەتی بە گرتنەدەستی جڵەوی فەرمانڕەوایی (لەلایەن سەرەك کۆمارەوە)
***n.*** ووتاری سەرەك کۆمار بە بۆنەی گرتنەدەستی جڵەوی فەرمانڕەوایییەوە.

**inaugurate** (in-ô′gyoo-rāt′), *v.t.* (١) جڵەوی فەرمانڕەوایی دانەدەست سەرەك کۆماری تازە: ***(to ~ a president)***.
(٢) بناغەدانان؛ ڕەنگ ڕشتن؛ دەستپێکردن؛ بناغە دارشتن:
***(The mayor ~d the new library.)***

**-inaugurator** ***(n.).***

**inauguration** (in-ô′gyoo-rā′shən), ***n.*** (١) جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتنەدەست (سەرەك کۆمار)؛ جڵەوی فەرمانڕەوایی دانەدەست.
(٢) دەستپێکردن؛ بناغە دارشتن؛ ڕەنگ ڕشتن.
(٣) کردنەوە (پرۆژە).

**Inauguration Day,** ڕۆژی جڵەوی فەرمانڕەوایی گرتنەدەست لەلایەن سەرەك کۆماری تازەی ئەمەریکاوە (کە ڕێکەوتی ٢٠ی ڕێبەندان دەکات).

**inauspicious** (in′ôs-pish′əs), ***adj.*** بەدووم؛ نەهات؛ بەووم: ***(an ~ sign)***

**in-born** (in′bôrn′), ***adj.*** زگماکی؛ سرووشتی؛ لەخۆوە؛ خۆیی

**in-bound** (in′bound′), ***adj.*** هاتوو: ***(an ~ train)***.

**inbred** (in′bred′), ***adj.*** (١) زگماکی؛ خۆیی.
(٢) ئەنجامی زاووزێی ناو خزم؛ لە نزیك بە خۆ چاك کراوە.

**inbreed** (in′brēd′, in′brēd′), ***v.t.*** (١) لە ناوەوە پەروەردەکردن یا پەیدابوون (٢) خزمی نزیکی خۆ هێنان؛ زاووزێ کردن لەگەڵ نزیك بە خۆدا

**Inc.,** = **incorporated.**

**incalculable** (in-kal′kyoo-lə-b'l), ***adj.*** (١) بێ شومار؛ نازمێرێ؛ بێ ئەندازە؛ نێجگار زۆر؛ لە ژماردن نایەت.
(٢) نازانرێ؛ پێشەکی؛ نەزانراو؛ پێشبینی نەکراو؛ پشت پێ نەبەستراو:
***(~ risks; ~ moods)***

**-incalculability** ***(n.)***; **incalculably** ***(adv.).***

**incandesce** (in′kən-des′), ***v.i. & v.t.*** بڵێسەدان؛ گڕگرتن؛ بریقانەوە؛ شەوقدانەوە؛ درەوشانەوە؛ داگیرسان

**incandescence** (in′kən-des′'ns), ***n.*** بڵێسە؛ بڵێسەدان؛ گڕگرتن؛ بریقە؛ بریقانەوە؛ شەوق؛ شەوقدانەوە؛ درەوشە؛ درەوشانەوە.

**incandescent** (in′kən-des′'nt), ***adj.*** (١) بڵێسەدار؛ گڕدار؛ داگیرساو؛ گەرمی و گڕی سوور یا سپی دەرەوە.
(٢) بە شەوق؛ شەوقدار؛ بریقاوە؛ درەوشاوە؛ زۆر ڕووناك: ***(~ light)***

**incandescent lamp,** گڵۆپی ئەلەکتریك؛ گڵۆپ.

**incantation** (in′kan-tā′shən), ***n.*** (١) دۆعا خوێندن لە کاتی نوشتەکردن یا جادووگەریدا. (٢) ئەم دۆعایە.
(٣) جادووگەری؛ نوشتەکردن؛ نوشتەلێکردن؛ ئەفسوون.

**incapable** (in-kā′pə-b'l), ***adj.*** بێ توانا؛ لە بارا نەبوو؛ لێ نەهاتوو.

**-incapability** ***(n.)***; **incapably** ***(adv.).***

incapable of, لە باریدا نییە؛ بۆی نییە؛ ناتوانێ؛ لە توانایدا نییە:
***(She is incapable of change.)***

**incapacitate** (in′kə-pas′ə-tāt′), ***v.t.*** (١) هێز لێ بڕین؛ پەککخستن؛ لەکارخستن. (٢) چرووك کردن (یاسایی).

**-incapacitation** ***(n.).***

**incapacitated** (in′kə-pas′ə-tāt′id), ***adj.*** بێکارە؛ پەککەوتوو؛ هێز لێ براو؛ لەکارکەوتوو

**incapacity** (in′kə-pas′ə-ti), ***n.*** (١) نەتوانین؛ لە توانادا نەبوون؛ لە باردا نەبوون؛ بێ توانایی. (٢) چرووك بوون؛ چرووك کران.

**incarcerate** (in-kär′sə-rāt′), ***v.t.*** (١) خستنە بەندیخانەوە؛ زیندانی کردن؛ گرتن (٢) بەستنەوە؛ کردنە ژوورەوە.

**-incarceration** ***(n.)***; **incarcerator** ***(n.).***

**incardinate** (in-kär′də-nāt′), ***v.t.*** (١) دانان بە قەشە
(٢) کردن بە کاردینال

**incarnadine** (in-kär′nə-dīn′), ***adj.*** سوور وەك خوێن یا گۆشت؛ ئاڵ.
*v.t.* سوورکردن؛ ئاڵ کردن؛ خوێناوی کردن.

**incarnate** (in-kär′nit), ***adj.*** (١) گیان بەبەرداکراو؛ لە لەش و گیانی ئادەمیزادا؛ نموونەی زیندوو ***(He is evil ~)***.
(٢) سوور؛ ئاڵ.
*v.t.* (١) (ا) گیان بەبەرداکردن؛ بەرجەستەکردن
(ب) شێوەی تایبەتی پێدان؛ زیندووکردن.
(٢) بوون بە نموونەیەکی زیندوو؛ نموونەکاری کردن:
***(He ~s the courage of the whole race.)***

**incarnation** (in′kär-nā′shən), ***n.*** (١) گیان بەبەرداکردن؛ گیان بەبەرداکران (٢) [-I]. گیانی ئادەمی بەبەراکردنی عیسا.
(٣) مرۆڤ یا گیاندارێك کە وەك خودا بپەرسترێ.

(٤) نموونەی زیندوو *( He is the ~ of courage.)*

**incase** (in-kās′), *v.t.* = encase.

**incauction** (in-kô′shən), *n.* ناهوشیاری؛ ناووریایی؛ بێ ئاگایی؛ بێباکی

**incautious** (in-kô′shəs), *adj.* ناهوشیار؛ ناووریا؛ هەڵەشە؛ بێباک.

**incendiary** (in-sen′di-er′i), *adj.* (١) سووتێنەر؛ تایبەتی بە سووتاندنی خانوو شتی بەنرخ بە دەستەنقەست؛ ئاگرتێبەردەر

(٢) سووتێنەر؛ بۆمبا؛ *( an ~ bomb)* .

(٣) ئاژاوەچی؛ تایبەتی بە ئاژاوەنانەوە

*n.* (١) سووتێنەری خانوو بە دەستەنقەست (مرۆڤ)؛ ئاگرتێبەردەر.

(٢) ئاژاوەچی؛ شۆڕشگێڕ (٣) بۆمبای سووتێنەر؛ شتی سووتێنەر

**incendiary bomb,** بۆمبای سووتێنەر؛ بۆمبایەکە کە دەتەقێتەوە ئاگریش دەگیرسێنێتەوە

**incense** (in′sens), *n.* (١) بخوور (٢) دووکەڵ و بۆنی بخوور.

(٣) بۆنێکی خۆش (٤) ستایش؛ ستایش کران؛ شکۆ پێدران.

*v.t.* (١) بۆن خۆش کردن؛ بە بخوور بۆن خۆش کردن.

(٢) بخوور بۆ سووتاندن.

*v.i.* بخوور سووتاندن

**incense** (in-sens′), *v.t.* ڕق هەڵساندن؛ زۆر تووڕەکردن؛

*( Her remarks ~d him.)*

**incentive** (in-sen′tiv), *n. & adj.* هاندەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ پاڵنەر؛ هانەهان

**inception** (in-sep′shən), *n.* سەرەتا؛ کاتی دەستپێکردن؛ دەستپێکردن *( The project ran into trouble from its ~ .)* .

**incertitude** (in-sûr′tə-tōōd′, in-sûr′tə-tūd′), *n.* (١) گومان؛ دوودڵی (٢) مەترسی پشت پێ نەبەستن (٣) بێ ئاسوودەیی؛ بێ ئاسایشی

**incessant** (in-ses′nt), *adj.* بەردەوام؛ سەرزمر؛ نەوەستاو؛ هەمیشە؛ بێ ووچان

-incessancy *(n.)*; incessantly *(adv.)*.

**incest** (in′sest), *n.* جووت بوون یا چوونە جێ لەگەڵ کەسێکی پێ نەشیاودا وە باوک و دایک و خوشک و براو منداڵی خۆ

**incestuous** (in-ses′choo-əs), *adj.* (١) تایبەتی بە جووت بوون یا چوونە جێ لەگەڵ کەسێکی پێ نەشیاودا وەک باوک و دایک و خوشک و براو منداڵی خۆ (٢) تاوانکارێکی وەها (٣) بەرهەمو ئەنجامی تاوانێکی وەها

**inch** (inch), *n.* (١) گرێ؛ ئینچ؛ دوانزە یەکی پێ یەک

(٢) ئەوەندەی گرێیەک باران یا بەفری باریو

(٣) ئەخت؛ تۆز؛ تۆسقاڵ؛ ئەختاڵ

*v.t. & v.i.* وورده وورده جووڵانەوە؛ زۆر بە هێواشی ڕۆیشتن یا بەرەوپێشەوە چوون.

by inches, وورده وورده؛ بەرەبەرە؛ زۆر بە هێواشی

every inch, لە هەموو ڕوویەکەوە؛ هەمووی؛ بە تەواوی

inch by inch, وورده وورده؛ بەرەبەرە؛ زۆر بە هێواشی

within an inch of, زۆر نزیک؛ هیچ دوور نییە لێوە

**inch** (inch), *n.* [Scottish]. دوورگە

**inchmeal** (inch′mēl′), *adv. Also* by inchmeal. وورده وورده؛ بەرەبەرە؛ لەسەرخۆ

**inchoate** (in-kō′it, in′kō-āt′), *adj.* ساوا (پرۆژە، کار)؛ تازە؛ سەرەتا

**incidence** (in′si-dəns), *n.* (١) ڕوودان؛ جۆری ڕوودان؛ ڕێکەوتن؛ ڕێکەوت (٢) مەودا یا پلەی ڕوودان؛ مەودای کارتێکردن

(٣) (ا) کەوتنەسەر؛ ڕووناکی؛ کەوتنەسەر ڕوویەک (فیزیا)

(ب) گۆشەی ئەم کەوتنەسەرە

**incident** (in′si-dənt), *adj.* (١) پێوەبەستراو؛ بەشێکە لە؛ لە ئەنجامی ئەوەدایە *( the cares ~ to leadership)*

(٢) کەوتەسەر؛ کەوتووەتەسەر ڕوویەک؛ *( ~ rays)*

(٣) دەکەوێتەسەر؛ بەوەوە بەستراوە.

*n.* (١) ڕوودان؛ ڕووداو؛ ڕێکەوت؛ بەسەرهات.

(٢) ڕوودان یا بەسەرهاتێکی بچووک کە بەشێکە لە ڕوودانێکی گەورەتر (بەتایبەتی لە چیرۆک و شانۆنامەدا)

(٣) شتێکی بەستراو بە شتێکی ترەوە (یاساناسی).

**incidental** (in′si-den′t'l), *adj.* (١) ڕێکەوت؛ ڕێکەوتە؛ ڕێکەوتی؛ بەشێکە لە ڕوودانێک یا شتێکی گەورەتر.

(٢) ناگرنگ؛ پەراوێزی؛ پاشکۆیی: *( ~ expenses)* .

*n.* (١) شتێکی ڕێکەوت (کە بەشێکە لە شتێك یا ڕوودانێکی گەورەتر).

(٢) *(pl.)*، وورده خەرجی؛ وورده شت؛ وورده خەرجی هەمەچەشنە.

**incidentally** (in′si-den′t'l-i), *adv.* (١) بە ڕێکەوت.

(٢) بەم بۆنەیەوە: ووتەیەکە لە پێشکەش کردنی دەنگوباس یا باسێکی تازەی ناگرنگ بەڵام پەیوەندیداردا دەووترێت، وەك دەڵێن: " ئای باش بوو بیرم کەوتەوە ": *( I~ I'll be home half an hour late today.)* .

**incinerate** (in-sin′ə-rāt′), *v.t.* سووتاندن تا دەبێ بە خۆڵەمێش.

-incineration *(n.)*.

**incinerator** (in-sin′ə-rā′tēr), *n.* (١) کوورە؛ فڕن (بەتایبەتی هی زبڵ یا پاشماوەی خواردن سووتاندن). (٢) فڕن یا کوورەی سووتاندنی لاشەی مردووان.

**incipient** (in-sip′i-ənt), *adj.* ساوا؛ تازە؛ تازە پەیدابوو یا سەرهەڵداو: *( an ~ tumor)* .

-incipience *(n.)*; incipiency *(n.)*.

**incise** (in-sīz′), *v.t.* (١) بڕین؛ هەڵتلیشاندن؛ هەڵدڕین.

(٢) لەسەر هەڵکەندن؛ لەناو هەڵکۆڵین؛ داتاشین؛ نەقش لەسەر هەڵکەندن

**incised** (in-sīzd′), *adj.* (١) (ا) هەڵدڕاو؛ بڕاو؛ هەڵتلیشێنراو.

(ب) نەقش لەسەر هەڵکەنراو

(٢) گرنج گرنج ( قەراغی گەڵا )

**incision** (in-sizh′ən), *n.* (١) هەڵدڕین؛ بڕین؛ هەڵتلیشان

(٢) تلیش؛ هەڵدڕاوی؛ بڕینێك؛ قڵیش. (٣) تیژی.

(٤) هەڵدڕینێکی ئەندام یا تێشووی لەش (نەشتەرکاری).

**incisive** (in-sī′siv), *adj.* (١) تیژ؛ بڕ؛ بڕندە.

(٢) تیژ (مێشك)؛ ڕوون؛ زیرەك *( an ~ mind)* .

(٣) بڕ (زمان)؛ ڕوون؛ پاراو؛ بڕندە: *( an ~ language)* .

-incisively *(adv.)*; incisiveness *(n.)*; incisor *(n.)*.

**incitation** (in′sī-tā′shən, in′si-tā′shən), *n.* (١) هاندان؛ هێنانە جۆش؛ کلك پێوەکردن؛ هەڵگیرساندن (ئاژاوە).

(٢) هاندەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ هانەهان.

**incite** (in-sīt′), *v.t.* هاندان؛ هێنانە جۆش؛ هانەهان دان؛ کلك پێوەکردن؛ هەڵگیرساندن (ئاژاوە): *( He ~d people to riot.)* .

**incitement** (in-sīt′mənt), *n.* (١) هاندان؛ هێنانە جۆش؛ هەڵگیرسان.

(٢) هاندەر؛ پاڵنەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ هێنەرەجۆش.

**incivility** (in′si-vil′ə-ti), *n.* (١) بێ ئەزاکەتی؛ بێ ڕەووشتی؛ ڕەووشت ناشرینی. (٢) کارێکی بێ ئەزاکەتانە؛ کردەوەیەکی ناشرین

**inclement** (in-klem′ənt), *adj.* (١) سەخت (ئاووهەوا)؛ سەرماو سۆڵەو باوبۆراناوی. (٢) توندوتیژ؛ بێ بەزەیی؛ دڵڕەق: *( an ~ judge)*

-inclemency *(n.)*.

**inclination** (in′klə-nā′shən), *n.* (١) نوشتانەوە؛ چەمینەوە؛ لێژی؛ لاری. (٢) گۆشەی نوشتانەوە.

(٣) ئارەزوو؛ هەوەس؛ حەز؛ ویست؛ مەیل؛ هەڵوێست.

(٤) شتێکی ویستراو.

**incline** (in-klīn′), *v.i.* (١) نوشتانەوە؛ چەمینەوە؛ لاربوونەوە.

(٢) سەردانەواندن؛ لەش نوشتانەوە؛ خۆ نوشتاندنەوە.

(٣) ویستن؛ ئارەزووکردن؛ مەیل کردن؛ مەیل بوون؛ حەزکردن.

*v.t.* (١) نوشتانەوە؛ لارکردنەوە؛ بەلاداخستن.

(٢) کارتێکردن؛ مەیل پێ پەیداکردن؛ دڵ پێ گۆڕین؛ دڵ پێ داهێنان؛

هەوەس پێ پەیداکردن

*n.* لێژایی؛ لێژی؛ سەرەوژوورکە؛ بەرەوژوورکە.

**incline one's ear,** گوێگرتن؛ گوێ پێدان

**inclined** (in-klīnd'), *adj.* (١) لار؛ خوار؛ بەلاداکەوتوو؛ چەوت

(٢) بە مەیل؛ بەئارەزوو؛ حەزکەر؛ بوێست

(٣) گۆشەیەکی درووستکردووە لەگەڵ هێڵێك یا ڕوویەکی تردا.

**inclined plane,** ڕووتەختێکی لار.

**inclinometer** (in'kli-nom'ə-tẽr), *n.* (١) پێوەری هێزی موگناتیسی زەمین (٢) پێوەری گۆشەی لاری ڕوویەك.

**inclose** (in-klōz'), *v.t.* = enclose.

**inclosure** (in-klō'zhẽr), *n.* enclosure.

**include** (in-klood'), *v.t.* (١) دەوردان؛ خستنەناوەوە؛ ئابلووقەدان؛ قەتیسدان (٢) گرتنەوە؛ تێدابوون

*( This atlas contains fifty maps ~ing six of North America.; There are ten of us in the house ~ing the four children.. They will send you the book for $ 10.00, postage ~d.)*

**inclusion** (in-kloo'zhən), *n.* (١) گرتنەوە؛ تیابوون؛ تێخستن؛ لەگەڵ بوون؛ خستنەناو (٢) ناوەڕۆك؛ شتێك لەناو شتێکی تردا.

(٣) شتێکی خاو لەناو بەردێك یا کانزایەکدا

**inclusive** (in-kloo'siv), *adj.* (١) گشتگیر؛ گشتی؛ هەمووی تێدایە؛ هەمووی دەگرێتەوە (٢) ئەمپەڕو ئەوپەڕو ناوەڕۆکەکەی هەمووی دەگرێتەوە:

*( A vacation from the first to the tenth ~ is a vacation of ten days.)*

**incognita** (in-kog'ni-tə), *n. & adj. feminine of* incognito.

**incognito** (in-kog'ni-tō'), *adv. & adj.* بە ناو و ناونیشان و بەرگی کەسێکی تردوە؛ بە خۆ گۆڕاوی بۆ نەناسینەوە؛ بە نەناسراوی:

*( The prince travelled ~.)*

*n.* (١) کەسێکی ناوونیشان و بەرگ و خۆگۆڕ بۆ نەناسینەوەی.

(٢) ناوونیشان و بەرگی خۆگۆڕین؛ خۆگۆڕین بۆ نەناسینەوە.

ب ناوونیشان و بەرگی تازەکراو بە هی خۆ (بۆ نەناسینەوە).

**incognizant** (in-kog'ni-zənt, in-kon'i-zənt), *adj.* نەزان؛ بێ ئاگ

**incoherence** (in'kō-hẽr'əns), *n.* (١) پچڕپچڕی و بزرکاوی و هیچ بەسەر هیچەوە نەبوون (نووسین، دووان، بیروڕا) (٢) ووتار، نووسین، یا بیروڕایەکی پچڕپچڕو هیچ بەسەر هیچەوە نەبوو

**incoherency** (in'kō-hẽr'ən-si), *n.* = incoherence.

**incoherent** (in'kō-hẽr'ənt), *adj.* پچڕپچڕ (نووسین، دووان، بیرورا)؛ بزرکاو؛ بێ سەروبن؛ شەل و پەت؛ هیچ بەسەر هیچەوە نەبوو.

**incombustible** (in'kəm-bus'tə-b'l), *adj.* نەسووت؛ ناگرنەگر

*( ~ material)*

-**incombustibility** *(n.).*

**income** (in'kum), *n.* دەسکەوت

**incomer** (in'kum'ẽr), *n.* هاتنەژوور؛ ئەوەی دێتە ژوورەوە

**income tax,** باجی دەسکەوت؛ باجی دەرامەت

**incoming** (in'kum'iŋ), *adj.* داهاتوو؛ هاتوو؛ ئایندە:

*( ~ profit; the ~ director)*

*n.* (١) هاتنەژوورەوە؛ هاتن (٢) هاتنەژوورەوە؛ ئەوەی کە دێتە ژوورەوە

**incommensurable** (in'kə-men'shoor-ə-b'l), *adj.* بەراوورد ناکرێن؛ بە هەمان پێوانە ناپێورێن: *( Coins and trees are ~ )*.

-**incommensurability** *(n.)*; **incommensurably** *(adv.).*

**incommensurate** (in'kə-men'shoor-it), *adj.* (١) ناهاوتا؛ ناتەکسە؛ ئەوەندەی یەك نین *( a reward ~ with his efforts)*

(٢) بەس نییە؛ کەم؛ بەش ناکات

(٣) بەراوورد ناکرێن؛ بە هەمان پێوانە ناپێورێن

-**incommensurately** *(adv.).*

**incommode** (in'kə-mōd'), *v.t.* پەستکردن؛ بێزارکردن؛ نارەحەت کردن

**incommodious** (in'kə-mō'di-əs), *adj.* (١) ناخۆش؛ ناپەسەند؛ پەستکەر؛ نارەحەت (٢) بچووك و تەنگەبەر؛ نارەحەت؛ بەش ناکات (جێ

**incommodity** (in'kə-mod'ə-ti), *n.* نارەحەتی؛ پەستی؛ ناخۆشی.

**incommunicable** (in'kə-mū'ni-kə-b'l), *adj.* (١) ناووترێ؛ ناتوانرێ بووترێ؛ ڕاناگەیێنرێ بە کەسی تر (٢) [Rare]، نەدوو؛ کەم دوو

-**incommunicability** *(n.)*; **incommunicably** *(adv.).*

**incommunicado** (in'kə-mū'ni-kä'dō), *n.* پەیوەندی لێ بڕاو؛ بە جیا؛ لێکبڕاو؛ دابڕاو؛ بە تەنها: *( The prisoners were held ~. )*

**incommunicative** (in'kə-mū'ni-kä'tiv), *adj.* نەدوو؛ کەم دوو؛ قسەنەکەر؛ بێ دەنگ.

**incommutable** (in'kə-mū'tə-b'l), *adj.* (١) ناگۆڕدرێ؛ گۆڕینی بۆ نییە (٢) ناگۆڕدرێتەوە؛ گۆڕینەوەی بۆ نییە.

**incomparable** (in-kom'pẽr-ə-b'l), *adj.* (١) بێ هاوتا؛ بێ وێنە: *( ~ beauty, skill, etc.)*.

(٢) بەراوورد ناکرێن؛ بە هەمان پێوانە ناپێورێن.

-**incomparability** *(n.)*; **incomparably** *(adv.).*

**incompatibility** (in'kəm-pat'ə-bil'ə-ti), *n.* لەگەڵ یەك هەڵ نەکردن؛ پێکەوە نەگونجان.

**incompatible** (in'kəm-pat'ə-b'l), *adj.* (١) پێکەوە نەگونجاو؛ لەگەڵ یەك هەڵ نەکردوو *( The two are ~ with each other.)*

(٢) هەمان کەس ناتوانێ هەردووکی بگرێتە دەست لە هەمان کاتدا (فرمان، پلەوپایە). (٣) تێکەڵاو ناکرێن؛ بەیەکەوە ناخورێن (دوو دەرمان).

**incompetence** (in-kom'pə-təns), *n.* ناکارامەیی؛ بێ توانایی؛ لێ نەهاتوویی؛ هیچ نەزانی؛ نەشارەزایی

**incompetency** (in-kom'pə-tən-si), *n.* incompetence.

**incompetent** (in-kom'pə-tənt), *adj.* (١) ناکارامە؛ بێ توانا؛ لێ نەهاتوو؛ نەشارەزا (٢) نەشیاو.

*n.* کەسێکی ناکارامە؛ کەسێکی بێ توانا و مێشك ناتەواو.

**incomplete** (in'kəm-plēt'), *adj.* (١) ناتەواو.

(٢) تەواو نەکراو؛ نیوەو نیوەچڵ.

(٣) کەموکووڕ؛ کەموکورت.

-**incompletely** *(adv.)*; **incompleteness** *(n.)*; **incompletion** *(n.).*

**incompliance** (in'kəm-plī'əns), *n.* پەیڕەوی نەکردن؛ مل نەدان؛ پەیمان شکاندن

**incompliant** (in'kəm-plī'ənt), *adj.* پەیڕەوی نەکەر؛ ملنەدەر؛ پەیمان شکێنەر

**incomprehensible** (in'kom-pri-hen'sə-b'l), *adj.* (١) سەری لێ دەرناکرێ؛ ناخوێنرێتەوە. (٢) کەس تێی ناگات؛ قووڵ؛ ناچێتە مێشکەوە؛ تێگەیشتنی بۆ نییە؛ سەیر؛ گران؛ لێڵ

(٣) [Archaic]. بێ شومار؛ بێ ئەندازە؛ زۆر

-**incomprehensibility** *(n.)*; **incomprehensibly** *(adv.).*

**incomprehension** (in'kom-pri-hen'shən), *n.* تێنەگەیشتن

**incomprehensive** (in'kom-pri-hen'siv), *adj.* ناتەواو؛ ناگشتی؛ هەموو شت ناگرێتەوە

**incompressible** (in'kəm-pres'ə-b'l), *adj.* ناپەسترێتەوە؛ بچووك ناکرێتەوە؛ کورت ناکرێتەوە

**inconceivable** (in'kən-sēv'ə-b'l), *adj.* ناشێ؛ نابێ؛ هەرگیز بۆی نییە ڕووبدات لەبەر نابەجێیی؛ بە مێشکدا ناچێت؛ کەس بڕوا ناکات ڕووبدات

-**inconceivability** *(n.)*; **inconceivably** *(adv.).*

**inconclusive** (in'kən-kloo'siv), *adj.* ناتەواو؛ نەسەلمێنەر؛

شتەکە ناخات بە لایەکدا؛ هیچ نابڕێنێتەوە: ***( ~ evidence)***

**incondensable** (in´kən-den′sə-b'l), ***adj.*** کورت ناکرێتەوە (ووتار، نووسراو)

**inconformity** (in´kən-fôr′mə-ti), ***n.*** = **non-conformity.**

**incongruent** (in-koŋ′grōō-ənt), ***adj.*** نەگونجاو، نەشیاو؛ لەگەڵ یەك نەگونجاو یا ڕێ نەکەوتوو؛ نابەجێ

**-incongruence** ***(n.)***; **incongruently** ***(adv.)***.

**incongruity** (in´kən-groo′ə-ti), ***n.*** (١) نەگونجان، نەشیان؛ لەگەڵ یەك نەگونجان؛ بۆ یەك نەبوون؛ لەیەك نەچوون (٢) نابەجێیی (٣) شتێکی نەگونجاو یا نەشیاو؛ شتێکی نابەجێ.

**incongruous** (in-koŋ′grōō-əs), ***adj.*** (١) نەگونجاو، نەشیاو؛ ناگونجێ لەگەڵ؛ لەگەڵ ڕێك نەکەوتوو: ***( a plan ~ with good sense)*** .
(٢) لەیەك نەچوو؛ جیا؛ جیا جیا؛ هەمەچیزە؛ دژ بە یەکتر: ***( an ~ group of people)***
(٣) ناچێتە مێشکەوە؛ ڕێی تێ ناچێ؛ ناقۆڵا: ***( an ~ story)***
(٤) نابەجێ، بێ جێ؛ لە جێی خۆیدا نییە: ***( an ~ remark)*** .

**-incongruously** ***(adv.)***; **incongruousness** ***(n.)***.

**inconsequent** (in-kon′si-kwent´), ***adj.*** (١) ئەنجامی شتێکی تر نییە (٢) بێ پەیوەندییە بە باسەکەوە؛ لە باس بەدەرە (٣) نابەجێ، ژیربێژی؛ ناچێتە مێشکەوە. (٤) لە سروشتی شتێك بەدەر؛ لێ نەوەشاوە (٥) ناگرنگ، بێ بایەخ؛ هیچ‌وپووچ.

**inconsequential** (in´kon-si-kwen′shəl), ***adj.*** (١) نابەجێ (ژیربێژی)؛ ناچێتە مێشکەوە (٢) ناگرنگ، بێ بایەخ؛ پڕووپووچ، بێ ئەنجام؛ زۆر کەم (کارتێکردن)
***n.*** شتێکی ناگرنگ یا هیچ‌وپووچ.

**inconsiderable** (in´kən-sid′ēr-ə-b'l), ***adj.*** ناگرنگ، بێ بایەخ، هیچ‌وپووچ، کەم (ڕادە، کارتێکردن)؛ بچووك

**inconsiderate** (in´kən-sid′ēr-it), ***adj.*** (١) ناژیرانە، بێ بیری لێ نەکراوەتەوە (٢) دڵی خەڵك ڕانەگر؛ بە تەنگ هەست و دڵی کەسەوە نەهات؛ گوێ نەدەرە کەس ***( an ~ person)***

**-inconsiderately** ***(adv.)***; **inconsiderateness** ***(n.)***; **inconsideration** ***(n.)***.

**inconsistence** (in´kən-sis′təns), ***n.*** = **inconsistency.**

**inconsistency** (in´kən-sis′tən-si), ***n.*** (١) لەگەڵ شتێکی تر نەگونجان، جیاوازی؛ ناکۆکی (٢) لەگەڵ خۆ نەگونجان؛ وەك یەك نەبوون؛ یەك دان نەبوون (٣) شتێکی نەگونجاو یا ناکۆك

**inconsistent** (in´kən-sis′tənt), ***adj.*** (١) لەگەڵ نەگونجاو، ناکۆك؛ جیاواز، جیا ***( practice ~ with belief)***
(٢) لەگەڵ خۆیدا نەگونجاو؛ لەگەڵ یەکتر نەگونجاو؛ نابەجێ؛ یەك دان نییە.
(٣) بگۆڕ؛ هەر تاوە بە جۆرێکە؛ حولحولی: ***( ~ behavior)*** .

**inconsolable** (in´kən-sol′ə-b'l), ***adj.*** دڵخۆشی نادرێتەوە؛ دڵشکست، دەسکاو، خەمبار

**inconsonant** (in-kon′sə-nənt), ***adj.*** ناسان، نەگونجاو، نارێك؛ ناکۆك

**-inconsonance** ***(n.)***.

**inconspicuous** (in´kən-spik′ū-əs), ***adj.*** سەرنج ڕانەکێش؛ نادیار، وون، مەجاز، شاراوە؛ لە بەرچاو نەبوو: ***( an ~ person)***

**-inconspicuously** ***(adv.)***; **inconspicuousness** ***(n.)***.

**inconstancy** (in-kon′stən-si), ***n.*** (١) بێ باری، حولحولێتی؛ بێ وەفایی (٢) هەمیشە گۆڕان؛ بگۆڕی (٣) نارێك‌وپێکی

**inconstant** (in-kon′stənt), ***adj.*** (١) بێ بار، حولحول، بێ وەفا؛ پشت پێ نەبەستراو (٢) بگۆڕ؛ دەمدەمی؛ هەمیشە دەگۆڕێ (٣) نارێك‌وپێك

**inconsumable** (in´kən-sūm′ə-b'l), ***adj.*** دوایی نایەت، نەهاتوو؛ هەمووی بەکار ناهێنرێت؛ تەواو نابێ

**incontestable** (in´kən-tes′tə-b'l), ***adj.*** ناکۆکی لەسەر نییە؛ چەندوچۆنی لەسەر نەماوە؛ بڕاوەتەوە؛ بێ گومان؛ بە درۆ ناخرێتەوە

**incontinence** (in-kon′tə-nəns), ***n.*** (١) خۆ بۆ نەگیران (هەوەسی جووت بوون و بە ئالۆشی)؛ بەرەڵایی (٢) زمان بۆ نەگیران؛ نهێنی نەپاراستن؛ دەمشڕی. (٣) خۆڕانەگرتن (چوونە ئاودەست)؛ میزو گوو بۆ ڕانەگیران.

**incontinent** (in-kon′tə-nənt), ***adj.*** (١) بەرەڵا؛ خۆ بۆ نەگر (جووت بوون و بە ئالۆشی). (٢) دەمشڕ؛ زمان بۆ نەگر؛ نهێنی نەپارێز (٣) خۆڕانەگر (چوونە ئاودەست)؛ میزو گوو بۆ ڕانەگیر.

**incontrollable** (in´kən-trōl′ə-b'l), ***adj.*** دابین نابێ؛ دابین ناکرێ؛ دابین نەکراو

**incontrovertible** (in´kon-trə-vûr′tə-b'l), ***adj.*** بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە؛ بە درۆ ناخرێتەوە؛ ڕاست؛ چەندوچۆنی لەسەر نییە: ***( ~ evidence, proof, etc.)***

**-incontrovertibility** ***(n.)***; **incontrovertibly** ***(adv.)***.

**inconvenience** (in´kən-vēn′yəns), ***n.*** (١) ناڕەحەتی؛ ناخۆشی؛ سەرئێشە؛ پەستی: ***( I'm sorry if I've caused you any ~ . )***
(٢) شتێکی پەستکەر، هەراسانکەر، سەرئێشێنەر، یا ناخۆش.
***v.t.*** سەرئێشاندن؛ ناڕەحەت کردن؛ پەستکردن؛ ئیسراحەت لێ تێکدان: ***( to ~ somebody by calling him late at night.)***

**inconveniency** (in´kən-vēn′yən-si), ***n.*** = **inconvenience.**

**inconvenient** (in´kən-vēn′yənt), ***adj.*** نەشیاو؛ نەگونجاو؛ ناپەسەند؛ ناڕەحەت، پەستکەر؛ خراپ؛ ناڕەحەتکەر: ***( She came at an ~ time.)***

**inconvertible** (in´kən-vûr′tə-b'l), ***adj.*** ناگۆڕدرێتەوە (پارەی کاغەز بە زێڕ یا بە پارەی بێگانە): ***( ~ paper money)*** .

**inconvincible** (in´kən-vin′sə-b'l), ***adj.*** پێی ناسەلمێنرێ.

**in-co-cordinate** (in′kō-ôr′də-nāt′), ***adj.*** (١) لە هەمان بابەت، جۆر، یا پلە نین؛ ناهاوتا؛ نایەکسان. (٢) نارێك‌وپێك؛ شێواو.

**in-co-ordination** (in´kō-ôr´də-nā′shən), ***n.*** (١) شێواوی؛ نارێك‌وپێکی. (٢) بزوانی ماسولکە بۆ دابین نەکران.

**incorporate** (in-kôr′pēr-it), ***adj.*** (١) کراو بەیەك؛ یەکخراو؛ تێکەڵاوکراو؛ یەك پێگیراو (٢) کراو بە بەشێك لە کۆمپانییەك؛ پێکەوەلکێنراو
***v.t.*** (١) کردن بەیەك؛ یەکخستن؛ یەك پێگرتن؛ تێکەڵاوکردن.
(٢) تێدابوون؛ گرتنەوە. (٣) کردنی دوو شار بەیەك.
(٤) وەرگرتن بە ئەندام لە کۆمەڵ یا کۆمپانییەکدا.
(٥) گیان بەبەرداکردن؛ لەش بەبەرداکردن
***v.i.*** بوون بەیەك؛ تێکەڵاوبوون؛ یەکگرتن.

**incorporate** (in-kôr′pēr-it), ***adj.*** = **incorporeal.**

**incorporated** (in-kôr′pə-rāt´id), ***adj.*** (١) یەکگرتوو؛ یەکخراو. (٢) خراوەتەسەر شارێکی تر؛ بووە بەیەك لەگەڵ شارێکی تر: ***( an ~ town)***

**incorporation** (in-kôr´pə-rā′shən), ***n.*** (١) کردن بەیەك؛ بوون بەیەك؛ یەکخستن؛ یەکگرتن؛ پێکەوەبەستن.
(٢) شارۆچکەیەك خستنەسەر شارێکی گەورەو کردنیان بەیەك.
(٣) بەشگە؛ کۆمپانیای هاوبەش.

**incorporeal** (in´kôr-pôr′i-əl, in´kôr-pō′ri-əl), ***adj.*** (١) بێ لەش؛ گیانی. (٢) فریشتەیی. (٣) لەشی نییە بەڵام بەلای یاساوە هەر هەیە (ماف، مافی داهێنان، ناوی بۆماوە لە باووباپیرەوە)

**incorporeity** (in´kôr-pə-rē′ə-ti), ***n.*** (١) بێ لەشی؛ بوونەوەری گیانی. (٢) شتێکی بێ لەش؛ سرووشتێکی بێ لەشی.

**incorrect** (in´kə-rekt′), ***adj.*** (١) نابەجێ؛ ناپەسەند؛ ناشرین (ڕەووشت، کردەوە، ووتە): ***( ~ behavior)***
(٢) درۆ؛ هەڵە؛ ڕاست نییە ***( ~ information; an ~ statement)*** .

**incorrigible** (in-kôr′i-jə-b'l, in-kor′i-jə-b'l), ***adj.*** (١) چاك ناکرێ؛ ناخرێتە سەر ڕێی ڕاست (مرۆڤ) (هەندێ جار لەرووی گاڵتەوە

*( an ~ child, man, etc.)*
(٢) جەسپیو؛ پتەو؛ لە ڕەگو ڕیشە دەرناهێنرێ *( an ~ innocence)*.
***n.*** کەسێك یا شتێك کە نەتوانرێ ڕاست بکرێتەوە
**-incorrigibility** *(n.)*.
**incorrupt** (in´kə-rupt´), *adj.* (١) بەرزیو خراپ نەبوو؛ نەگەنیو.
(٢) پاك (مرۆڤ)؛ ڕاست؛ سەرڕاست؛ بێ لەکە (٣) بەرتیل نەخۆر؛
بەرتیل وەرنەگر (٤) بێ هەڵە (نووسراو، زمان)
**-incorruption** *(n.)*.
**incorruptible** (in´kə-rup´tə-b'l), *adj.* (١) بەرتیل ناخوا؛
بەرتیل وەرناگرێ؛ ڕەووشتی خراپ ناکرێ؛ بەدڕەفتار نابێ.
(٢) نابڕێ (بەردی بەنرخ)؛ وەك خۆی دەمێنێتەوە
**-incorruptibility** *(n.)*; **incorruptibly** *(adv.)*.
**increase** (in-krēs´), *v.i.* (١) زۆربوون؛ زیادبوون؛ فرەبوون؛ زیادکردن؛
پەرەسەندن (٢) زۆربوون بە زاوزێ؛ زاوزێ کردن
***v.t.*** زیادکردن؛ زۆرکردن؛ پەرەپێدان؛ خستنەسەر.
***n.*** (١) زیادبوون؛ زۆربوون؛ پەرەسەندن
(٢) زیادە *( The population showed an ~ of 10 percent.)*
**-increaseable** *(adj.)*.
**on the increase,** لە پەرەسەندندایە؛ لە زیادبووندایە
**increasingly** (in-krēs´iŋ-li), *adv.* هەتا بێ زیاتر؛ زیاتر لەمەوبەر
*( The world is getting ~ more dangerous.)*
**incredible** (in-kred´ə-b'l), *adj.* بڕوای پێ ناکرێ؛ زۆر سەیر؛
ناچێتە مێشکەوە؛ سەیر؛ سەمەکار؛ لەبەر نائاسایی جێی بڕوا نییە (باشی،
خراپی) *( He is ~.; an ~ story)*
**-incredibility** *(n.)*.
**incredibly** (in-kred´ə-bli), *adv.* (١) بەشێوەیەك کە بڕوای پێ
ناکرێ (٢) بە ڕادەیەکی سەیرو نائاسا؛ بە ڕادەیەك کە ناچێتە مێشکەوە یا
مایەی سەرسامی و بڕوانەکردنە *( He is ~ stupid, cruel, etc.)*.
**incredulity** (in´krə-doo´lə-ti, in´krə-dū´lə-ti), *n.* گومان؛
بێ بڕوایی؛ دوودڵی
**incredulous** (in-krej´oo-ləs), *adj.* (١) بێ بڕوا؛ دوودڵ؛ بەگومان؛
گوماندار (٢) گومان پیشاندەر *( an ~ look)*.
**increment** (in´krə-mənt, iŋ´krə-mənt), *n.* (١) زیادبوون؛
پەرەسەندن؛ زۆربوون (٢) پلەی زیادبوون؛ ڕادەی زۆربوون.
**-incremental** *(adj.)*.
**incriminate** (in-krim´ə-nāt´), *v.t.* (١) تاوانبار کردن؛
گومانبار کردن؛ - خەی تاوانباری بۆ دریژکردن (٢) تووش کردن؛ پێوەکردن.
**-incrimination** *(n.)*; **incriminator** *(n.)*.
**incubate** (in´kyoo-bāt´, iŋ´kyoo-bāt´), *v.t.* (١) لەسەر هێلکە و
هەڵهێنانی هێلکە (باڵندە)؛ هەڵهێنانی هێلکە بە مەکینە (٢) خستنە شوێنێکی
باش و گەرمەوە بۆ گەورەبوون (منداڵی زوو لەدایکبوو، بەکتریا).
***v.i.*** (١) هەڵهاتن (هێلکە) (٢) پەرەسەندن؛ گەورەبوون
**incubation** (in´kyoo-bā´shən, iŋ´kyoo-bā´shən), *n.* (١)
هەڵهێنان (هێلکە)؛ هەڵهاتن؛ پەروەردەبوون (بەکتریا)
(٢) ماوەی نێوان تووش بوونی نەخۆشییەك و دەرکەوتنی نیشانەکانی.
**incubator** (in´kyoo-bā´tēr, iŋ´kyoo-bā´tēr), *n.* (١) مەکینەی
هێلکە هەڵهێنان (٢) مەکینەی منداڵی زوو لەدایکبوو تیا گەورەکردن.
(٣) مەکینەی بەکتریا تیا بەخێوکردن
**incubus** (in´kyoo-bəs, iŋ´kyoo-bəs), *n.* (١) خێوێك گوایە بە
شەو سواری مرۆڤی نووستوو دەبێ و لەگەڵ ژندا جووت دەبێ. (٢) مێردەزمە.
(٣) بارێکی قورس و ناخۆش؛ شتێکی ناخۆش.
**inculcate** (in-kul´kāt, in´kul-kāt´), *v.t.* فێرکردن؛ مەشق دادان؛
گۆش کردن؛ دەرس دادان.
**-inculcation** *(n.)*; **inculcator** *(n.)*.
**inculpable** (in-kul´pə-b'l), *adj.* بێ تاوان؛ بێ سووچ؛ بێ گوناه.

**inculpate** (in-kul´pāt, in´kul-pāt´), *v.t.* = **incriminate.**
**incumbency** (in-kum´bən-si), *n.* (١) جڵەوی فەرمانڕەوایی
لەدەستدابوون؛ پێویستی سەرشان لەسەربوون.
(٢) پێویستی سەرشان؛ ئەرك؛ بار (٣) (ا) جڵەوی فەرمانڕەوایی یا کڵێسە
(ب) ماوەی ئەم جڵەو بەدەستەوە بوونە.
**incumbent** (in-kum´bənt), *adj.* (١) قورسایی خۆ لەسەر ڕاگر؛
لەسەر وەستاو؛ پاڵ پێوەدەر (٢) نزیك (کاتی ڕوودان).
(٣) پێویست (ئەرکی سەرشان) (٤) جڵەوی فەرمانڕەوایی بەدەست.
***n.*** کەسێك کە جڵەوی فەرمانڕەوایی لەدەستدایە
**incumbent on (or upon),** پێویستی سەرشانە.
**incunabula** (in´kyoo-nab´yoo-lə), *n.pl.* (١) ساوایی؛ سەرەتا.
(٢) پەڕتووکی کۆن لەچاپدراو (بەتایبەتی پێش ساڵی ١٥٠٠ز).
**incur** (in-kûr´), *v.t.* هێنان بەسەر خۆدا (کاری ناخۆش)؛
خۆ تووش کردن
**incurable** (in-kyoor´ə-b'l), *adj.* بێ چار؛ بێ دەرمان؛ بێ چارە؛
چار ناکرێ.
**incursion** (in-kûr´zhən, in-kûr´shən), *n.* هێرش بردنە سەر؛
پەلاماردان؛ شاڵاو بۆهێنان؛ چوونەناو وڵاتی دوژمن.
**indebted** (in-det´id), *adj.* (١) قەرزار.
(٢) چاوبەرەوژێر؛ مەمنوون *( to be ~ to someone for a favor)*
**indebtedness** (in-det´id-nis), *n.* (١) قەرزاری.
(٢) چاوبەرەوژێری؛ مەمنوونی (٣) قەرز؛ چاکە
**indecency** (in-dē´s'n-si), *n.* (١) بێ شەرم و شکۆیی؛ بەدڕەفتاری؛
بێ ڕەووشتی؛ نزمی؛ ناپیاوی (٢) کردەوە یا کارێکی نزم و بێ شەرمانە
**indecent** (in-dē´s'nt), *adj.* بێ شەرم و شکۆ؛ نزم؛ ناپیاو؛ بەدڕەفتار؛
بێ ڕەووشت؛ ناشرین (ڕەووشت، زمان)؛ بەرەڵا؛ سەرسەری؛ بێ ئابڕو
*( ~ exposure, behavior, language, etc.)*
**indecipherable** (in´di-sī´fēr-ə-b'l), *adj.* ناخوێنرێتەوە؛
دەرناکرێ لەبەر خراپ نووسراوی.
**indecision** (in´di-sizh´ən), *n.* ڕاڕایی؛ دوودڵی؛ بڕیار بۆ نەدران.
**indecisive** (in´di-sī´siv), *adj.* (١) شت یەکلانەکەرەوە؛
شت بەلایەکدانەخەر *( an ~ victory)*.
(٢) ڕاڕا؛ دوودڵ؛ بڕیارنەدەر *( an ~ person)*.
**indeclinable** (in´di-klīn´ə-b'l), *adj.* گەردان ناکرێ (ڕێزمان)؛
شێوەی ناگۆڕێ (ووشە، ڕێزمان).
**indecomposable** (in´dē-kəm-pōz´ə-b'l), *adj.* ناگەنێ؛
شی نابێتەوە؛ داناڕزێ.
**indecorous** (in-dek´ə-rəs, in´di-kō´rəs), *adj.* ناشرین
(کردەوە، ڕەووشت، زمان)؛ نابەجێ (بەرگ، ڕەووشت).
**indecorum** (in´di-kôr´əm, in´di-kō´rəm), *n.* (١) نابەجێیی
(ڕەووشت، کردەوە، بەرگ، زمان)؛ ناشرینی (ڕەفتار)
(٢) کردەوە، ووتە، یا ڕەفتارێکی ناشرین.
**indeed** (in-dēd´), *adv.* بەڕاستی؛ بێگومان؛
*( It is ~ warm.; I was ~ glad to see her.)*
***interj.*** ووتەیەکە سەرسامی، گومان، داخ، یا تەوس دەردەبڕێ؛ ڕاستە!؛
تەواوە! (بەتەوسەوە)؛ بێگومان!؛ بە ڕاستتە؟ (سەرسامی، تەوس)
**indefatigable** (in´di-fat´i-gə-b'l), *adj.* ماندوو نابێ؛ ماندوو
بوونی بۆ نییە.
**-indefatigability** *(n.)*; **indefatigableness** *(n.)*;
**indefatigably** *(adv.)*.
**indefensible** (in´di-fen´sə-b'l), *adj.* (١) ناپارێزرێ؛ ناتوانرێ
بپارێزرێ (٢) نارەوا؛ ناهەق.
**-indefensibility** *(n.)*; **indefensibly** *(adv.)*.
**indefinable** (in´di-fīn´ə-b'l), *adj.* دیاری نەکراو؛ دیاری ناکرێ؛
پەنجەی ناخرێتە سەر؛ سنووری بۆ دانانرێ.

**indefinite** (in-def′ə-nit), *adj.* (١) سنوور بۆ دانەنراو؛ نادیار؛
دیاری نەکراو؛ کات بۆ دانەنراو. (٢) نامسۆگەر.
(٣) ناتایبەتی (ئامراز (ڕێزمان)؛ نەناس.
*( "A" and "an" are ~ articles.)*
-indefiniteness *(n.).*

**indefinite article,** ئامرازی ناتایبەتی (ڕێزمان)؛ ئامرازی نەناس.
*( a, an)*

**indefinitely** (in-def′ə-nit′li), *adv.* تا کاتێکی دیاری نەکراو؛
*( The meeting was postponed ~ .)*

**indelible** (in-del′ə-b'l), *adj.* ناسڕێتەوە؛ ناکوژێتەوە؛
ناکوژێنرێتەوە؛ هەتاهەتایی؛ لانابرێ.
*( ~ ink; ~ shame; an ~ impression, memory)*
-indelibly *(adv.).*

**indelicacy** (in-del′i-kə-si), *n.* (١) نابەجێیی کردەوە، وتە، زمان،
ڕەووشت؛ بێ نەزاکەتی؛ ناشرینی (ڕەفتار). (٢) کردەوە، وتە، یا ڕەفتارێکی
ناشرین

**indelicate** (in-del′i-kit), *adj.* بێ نەزاکەت؛ بێ ڕەووشت؛
ناشرین (ڕەفتار)؛ نابەجێ (وتە، کردەوە)

**indemnify** (in-dem′nə-fī′), *v.t.* (١) بیمەکردن لە زیان پاراستن
(٢) زیان بۆ بژاردن؛ بژاردن
-indemnification *(n.)*; indemnifier *(n.).*

**indemnity** (in-dem′nə-ti), *n.* (١) بیمە؛ لە زیان پاراستن
(٢) بەخشین (تاوان)؛ نەپرسینەوە، قەرز (٣) بژاردن؛ زیان بۆ بژاردن

**indemonstrable** (in′di-mon′strə-b'l), *adj.* پیشان نادری
ناخرێتە پێش چاو؛ ناسەلمێنرێ

**indent** (in-dent′), *v.t.* (١) قەراغ گرنج گرنج کردن.
(٢) دڕاندنی بروانامەیەکی دوو دانەیی لەسەر هێڵێکی ناڕێک بۆ سەرلەنوێ
بەیەکەوە نانیان لەدواییدا بۆ سەلماندنی ڕاست و درۆیی بروانامەکە.
(٣) نووسینی قۆنتەراتێک بە دوو دانە. (٤) بەجێهێشتنی نەختێک بۆشایی لە
سەرەتای بەند؛ بەجێهێشتنی پەراوێزێکی پانتر لە ئاسایی (لە وەرگرتنی شت
لە سەرچاوەی ترەوە یا تۆمارکردنی دەقاودەقی ووتارێک... هتد)؛
بردنەناوەوەی نووسین لە پەراوێزی ئاسایی زیاتر.
(٥) داواکردن و کڕینی شتوومەک بە نووسین
*v.i.* (١) گرنج گرنج بوون. (٢) قۆنتەرات کردن.
(٣) نووسینی قۆنتەراتێک بە دوو دانە
(٤) بەجێهێشتنی پەراوێزی پانتر لە ئاسا (ژمارە چوار ببینە)
*n.* (١) قلیشی شتێکی قەراغ گرنج گرنج (٢) قۆنتەراتێکی نووسراوە.
(٣) پەراوێزی پان؛ بۆشایی سەرەتای بەند
(٤) دێر یا بەندێکی براوە ناوەوە، واتە پەراوێز پان
(٥) داوای شت کڕین بە نووسراوی

**indent** (in-dent′), *v.t.* (١) قوپاندن (٢) نیشانەکردن؛ نیشانە لەسەر
هەڵکەندن؛ مۆرکردن؛ مۆر لەسەر هەڵکەندن
*n.* قوپاوی؛ قوپان

**indentation** (in′den-tā′shən), *n.* (١) بۆشایی بەجێهێشتن لە
سەرەتای بەند؛ پەراوێزی پان بەجێهێشتن (٢) قلیشی شتێکی قەراغ گرنج
گرنج (٣) قوپاوی؛ قوپان (٤) بۆشایی سەرەتای بەند؛ بردنەناوەوەی
نووسین لە پەراوێزی ئاسایی زیاتر

**indention** (in-den′shən), *n.* (١) بۆشایی بەجێهێشتن لە سەرەتای
بەند؛ پەراوێزی پان بەجێهێشتن (٢) ئەم بۆشاییە یا پەراوێزە پانە.
(٣) قوپاوی؛ قوپان

**indenture** (in-den′chēr), *n.* (١) بروانامەیەکی دوو دانەیی قەراغ
گرنج گرنج (٢) *(pl.)* قۆنتەراتێکی شاگردی یا کار بۆکردن بۆماوەیەکی
تایبەتی (٣) لیستەی شتوومەک کڕین؛ لیستەی ڕەسمی
(٤) بۆشایی سەرەتای بەند؛ پەراوێزی پان
*v.t.* (١) پێکەوەنووساندن یا لەیەکدان لە ڕێگای قەراغ گرنج گرنجاوی

(٢) بۆشایی بەجێهێشتن لەسەرەتای بەندا؛ پەراوێزی پان بەجێهێشتن.

**independence** (in′di-pen′dəns), *n.* (١) سەربەخۆیی؛ خۆبوون؛
سەربەستی. (٢) دەسکەوتێک کە بەشی دەرامەت بکات.

**Independence Day,** ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمەریکا (کە ڕێکەوتی
چواری تەمووزی ١٧٧٦ دەکات).

**independency** (in′di-pen′dən-si), *n.* (١) سەربەخۆیی؛
سەربەستی؛ خۆبوون. (٢) وڵات یا گەلێکی سەربەخۆ.

**independent** (in′di-pen′dənt), *adj.* (١) سەربەخۆ؛ سەربەست.
(٢) لەژێر ڕکێفی کەسدا نییە؛ سەربەست: *( ~ thinking)* .
(٣) لە هیچ حیزب یا کۆمەڵەیەکدا نییە: *( an ~ voter, person, etc.)* .
(٤) جیا؛ سەربەخۆ: *( an ~ grocer)* .
(٥) سەربەخۆی داراییە؛ خۆی خۆی دەژێنێ؛ یارمەتی لە کەسەوە وەرناگرێ
(٦) دەسکەوتێکی تایبەتی هەیە و ئیش ناکات بۆ پارە پەیداکردن.
*n.* (١) کەسێکی سەربەخۆ (لەبیرکردنەوە و کرداردا)؛ کەسێک کە سەر بە هیچ
حیزب یا لایەنێک نەبێت. (٢) [I-]؛ کەسێک کە داوای سەربەخۆیی کڵێسەی
هەموو ناوچەیەک دەکات.
-independently *(adv.).*
**independent of,** بەبێ؛ بێ؛ بێ گوێ دان بە؛ جگە لە.

**independent clause,** دەستەواژەی سەربەخۆ (ڕێزمان)

**indescribable** (in′di-skrīb′ə-b'l), *adj.* باس ناکرێ؛
وەسف ناکرێ.
-indescribability *(n.)*; indescribably *(adv.).*

**indestructible** (in′di-struk′tə-b'l), *adj.* لەناونابرێ؛
نافەوتێنرێ؛ ناڕووخێنرێ.
-indestructibility *(n.)*; indestructibleness *(n.)*;
indestructibly *(adv.).*

**indeterminable** (in′di-tũr′mi-nə-b'l), *adj.* (١) بڕیاری لەسەر
نادرێ؛ ناتوانرێ بخرێت بەلایەکدا یا ببڕێنرێتەوە. (٢) دیاری ناکرێ؛
دیاری نەکراو؛ نازانرێ چەندە یا سنووری کامەیە

**indeterminate** (in′di-tũr′mə-nit), *adj.* (١) دیاری نەکراو؛
لێڵ؛ نەزانراو: *( an ~ result)*
(٢) بڕیار نەدراو؛ نەبڕاوە؛ بەلایەکدا نەخراو.
(٣) پێشەکی نەزانراو. (٤) دوودڵی؛ ڕاڕایی.
(٥) هێشووی (ڕووەکناسی).
-indeterminately *(adv.)*; indetermination *(n.).*

**indeterminism** (in′di-tũr′min-iz'm), *n.* فەلسەفەیەکە دەڵێت:
کە مرۆڤ دەسەڵاتی هەیە بەسەر چارەنووسی خۆیدا و ئازادە لە هەڵبژاردنی
ڕێبازو چارەنووسی خۆیدا و هەمووشت لە ناوچەوانی نەنووسراوە.

**index** (in′deks), *n.* (١) دۆشاومژە؛ پەنجەی شایەتمان.
(٢) نیشاندەر؛ پیشاندەر؛ میل.
(٣) نیشانە: *( Performance is an ~ of ability.)* .
(٤) (ا) پێڕست؛ لیستەی نیشاندەری لاپەڕەی گرنگترین شتی ناو پەرتووکێک
لە دوا لاپەڕەکەیدا (ب) کەتەلۆگ؛ لیستەی نیشاندەری جێی دۆزینەوەی
شت: *( a library ~ )*.
(٥) ڕێژە.
(٦) [Obs.]، نەخشەی ناوەڕۆکی پەرتووک؛ ناوەڕۆک و پێشەکی.
(٧) نیشانەی دۆشاومژە بۆ پەنجەڕاکێشان بۆشتێک (چاپەمەنی).
*v.t.* (١) (ا) پێڕست بۆ ئامادەکردن (ب) خستنە پێڕستەوە؛ خستنە لیستەوە
(٢) نیشاندان؛ پیشاندان؛ دەرخستن.

**index finger,** دۆشاومژە؛ پەنجەی شایەتمان.

**India** (in′di-ə), *n.* هیندستان؛ هیند

**Indiaman** (in′di-ə-mən), *n.* کەشتییەکی بازرگانی گەورەیە بۆ
هاتوچۆ لەنێوان هیند و ئینگلتەرەدا.

**Indian** (in′di-ən), *adj.* (١) هی هیندستان و هیندی ڕۆژهەڵاتی و گەل و
کلتووریان. (٢) هی هیندی ئەمەریکایی و کلتورەکەیان (هیندە سوورەکان)

*n.* (١) هیندی؛ هاوولاتی‌یەکی هیندستان یا هیندی ڕۆژهەلاتی.
(٢) هیندی ئەمەریکایی؛ هیندی سوور.
(٣) یەکێك لە زمانەکانی هیندە ئەمەریکایی‌یەکان

**Indian file,** ڕیزە پیادەی یەك کەسی.
**Indian giver,** [Colloq.]. کەسێکە کە دیاری‌یەك یا شتێك دەبەخشێ‌و دوایی داوای دەکاتەوە یا دەیسەنێتەوە (یا هەر بەو نیازە دەیدات کە لەباتی ئەوە شتێکی بدرێتێ)؛ بەخشندەی درۆ.
**Indian summer,** (١) هاوینە درۆزنە؛ ماوەیەکی کورتی گەرم‌و ئاووهەوا خۆش لە کۆتایی پایزدا (بەتایبەتی لە ئەمەریکادا)؛ هاوینە بچکۆلە.
(٢) ماوەیەکی خۆش‌و پڕ ئاسوودە لە کۆتایی ژیان، قۆناغ، چەرخ، یا شتێکدا.
**Indic** (in′dik), *adj.* (١) هیندی؛ هیندستانی.
(٢) تایبەتی بە لقێك لە زمانە هیندۆ–ئەورووپی‌یەکان کە زۆربەی ئەو زمانانە دەگرێتەوە کە لە هیندستان قسەی پێکراوە یا پێ‌ی دەکرێت.
**indicant** (in′di-kənt), *adj. & n.* نیشاندەر.
**indicate** (in′də-kāt′), *v.t.* (١) پیشاندان؛ نیشاندان؛ دەرخستن.
(٢) نیشانەی ئەوە بوون: ( *Thunder ~s that a storm is near.*) .
(٣) پێویست بەوە بوون.
(٤) ووتن؛ ڕاگەیاندن؛ واگەیاندن؛ دەربڕین بە کورتی:
*( He ~d that he would co-operate with us.)*
**indication** (in′də-kā′shən), *n.* (١) پیشاندان؛ نیشاندان؛ دەرخستن (٢) نیشانە؛ بەڵگە: ( *Is this an ~ of how she feals?*) .
(٣) پلەی نیشاندراو بە پێوانە یا نیشاندەرێك.
**indicative** (in-dik′ə-tiv), *adj.* (١) نیشانەی ئەوەیە؛ ئەوە دەگەیەنێت: ( *actions ~ of love, hate, fear, hope, etc.*) .
(٢) تایبەتی بە کردار لەباری ڕاگەیاندن، ووتن، نیشاندان، یا پرسیاردا (ڕێزمان).
*n.* (١) باری ڕاگەیاندن، ووتن، نیشاندان، یا پرسیارکردن (ڕێزمان):
*( We rented a house.; Will you be on time?)*
(٢) کردارێك لەم بارەدا.
**indicator** (in′də-kā′tēr), *n.* نیشاندەر؛ پیشاندەر؛ میل؛ نیشانکەر.
**indices** (in′də-sēz′), *n. alternative plural of* index.
**indict** (in-dīt′), *v.t.* (١) تاوانبارکردن؛ گومانبارکردن؛ تاوان دانەپاڵ.
(٢) بە ڕەسمی گومانبارکردن بۆ دان بە دادگا.
**-indictable** *(adj.)*; **indictee** *(n.)*; **indicter, indictor** *(n.)*.
**indiction** (in-dik′shən), *n.* (١) فەرمانی ئیمپراتۆری ڕۆما دەربارەی باج لەسەردانان لە سەرەتای هەموو ماوەیەکی پانزە ساڵیدا.
(٢) ئەم جۆرە باجە. (٣) (ا) ماوەیەکی پانزە ساڵی.
(ب) ساڵێکی تایبەتی لەم ماوەیەدا.
**indictment** (in-dīt′mənt), *n.* (١) تاوانبارکردن؛ تاوانباری؛ تاوان:
*( It is an ~ of the regime.)*
(٢) بە ڕەسمی گومانبارکردن بۆ دان بە دادگا.
**indifference** (in-dif′ēr-əns, in-dif′rəns), *n.* (١) گوێ نەدان؛ بەدەربەستەوە نەهاتن؛ بێ دەربەستی؛ بەتەنگەوە نەهاتن؛ کەمتەرخەمی؛ بێباکی؛ بێ هەستی. (٢) بێ لایەنی. (٣) بێ بایەخی؛ ناگرنگی.
**indifferent** (in-dif′ēr-ənt, in-dif′rənt), *adj.* (١) بێ لایەن.
(٢) بەدەربەستەوە نەهاتوو؛ بێ دەربەست؛ بەتەنگەوە نەهاتوو؛ کەمتەرخەم؛ گوێ نەدەر؛ بێباك؛ دوورەپەرێز؛ هیچ مەبەست نەبوو:
*( He is ~ to everything.)*
(٣) بێ بایەخ؛ ناگرنگ.
(٤) (ا) مام ناوەندی؛ ڕەشۆکی؛ بازاڕی؛ نە باش‌و نە خراپ.
(ب) خراپ؛ بەکارنەهاتوو. (٥) نە ڕاست‌و نە هەڵە.
(٦) جیاناکرێتەوە (ژیوارناسی).
**-indifferently** *(adv.)*.
**indigence** (in′di-jəns), *n.* هەژاری؛ نەبوونی؛ نەبوون؛ دەستکورتی؛ بێ دەرامەتی؛ فەقیری.

**indigene** (in′di-jēn′), *n. Also* **indigen,** گیاندار یا ڕووەکێکی خۆوولاتی، خۆماڵی، خۆیی، یا تایبەتی بە ناوچەیەکی تایبەتی خۆیی
**indigenous** (in-dij′ə-nəs), *adj.* (١) خۆوولاتی (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك)؛ خۆماڵی؛ خۆیی؛ بنەچەیی؛ خەڵکی ناوچەکە خۆی؛ ڕیشەیی؛ هی شوێنەکە خۆی؛ تایبەتی بە خۆ:
*( an ~ population; an ~ plant, animal or person)*
(٢) زگماکی؛ زگماك؛ ناوەکی.
**indigent** (in′di-jənt), *adj.* هەژار؛ بێ دەرامەت؛ دەستکورت؛ نەبوو؛ فەقیر.
**indigested** (in′də-jes′tid), *adj.* (١) باش بیری لێ نەکراوەتەوە؛ باش لێی نەکۆڵراوەتەوە. (٢) شێواو؛ تێکەڵاو‌وپێکەڵاو.
(٣) پەلەخورد نەکراو.
**indigestible** (in′də-jes′tə-b'l), *adj.* پەلەخورد ناکرێ.
**-indigestibility** *(n.)*.
**indigestion** (in′də-jes′chən), *n.* گرفت؛ گرفت کردن.
**indigestive** (in′də-jes′tiv), *adj.* (١) گرفت کردوو.
(٢) گرفتی کردووە. (٣) گرفت بە مرۆڤ دەکات.
**indign** (in-dīn′), *adj.* [Obs.], (١) بێ قەدر؛ بێ بایەخ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ؛ هەڵناگرێ؛ شایشتە نی‌یە. (٢) شوورەیی.
**indignant** (in-dig′nənt), *adj.* تووڕە (بەتایبەتی بەهۆی کردەوەیەك یا شتێکی ناڕەواوە).
**indignation** (in′dig-nā′shən), *n.* تووڕەیی.
**indignity** (in-dig′nə-ti), *n.* (١) *(pl.)* ، ڕیسواکەر؛ نامووس شکێن؛ حەیابەر؛ بە سووك تەماشاکردن:
*( They subjected us to all sorts of ~ies.)*
(٢) [Obs.]، (ا) بێ ئابڕوویی؛ ڕیسوایی.
(ب) کردەوەی سووك، ناشرین، بێ ئابڕووانە.
(ج) تووڕەیی (لەسەر کاری ناڕەوا).
**indigo** (in′di-gō′), *n.* (١) خومی شین.
(٢) ڕووەکێکە ئەم خومە شینەی لێ دەردەهێنرێت.
(٣) ڕەنگی شین؛ شینێکی تۆخ؛ شینێکی ئەرخەوانی تۆخ.
**indirect** (in′də-rekt′), *adj.* (١) بە پێچ‌وپەنا؛ ناڕێك؛ ناڕاستەوخۆ؛ پێچاوپێچ: ( *an ~ route; an ~ reply*) .
(٢) چەوت؛ فڕوفێڵاوی؛ ناپاك ( *~ dealing*) .
(٣) ناڕاستەوخۆ؛ لەلاوە: ( *~ benefits; an ~ result*) .
(٤) ناڕاستەوخۆ (دووان؛ ووتە): ( *~ speech, discourse, etc.*) .
**indirect discourse,** ووتەی ناڕاستەوخۆ؛ دووانی ناڕاستەوخۆ؛ ووتەیەکە کە دەقاودەق هی قسەکەر نەبێ:
*( She said that she could not go.)*
**indirection** (in′də-rek′shən), *n.* (١) کردار، ڕێباز، یا ڕێگەی ناڕاستەوخۆو پێچاوپێچ. (٢) فڕوفێڵ؛ چەوتی؛ ناپاکی؛ سەرچەوتی؛ ساختە.
**indirect object,** تەواوکەری ناڕاستەوخۆ (ڕێزمان)؛ ئامانج یا کار لەسەری ناڕاستەوخۆ: ووشەی " him " و " her " لەم دوو ڕستەیەدا:
*( She gave him the book.; I did her a favor.)*
**indiscernible** (in′di-zūr′nə-b'l), *adj.* هەست پێ نەکراو؛ جیا ناکرێتەوە؛ ئەوەندە کەمە نابینرێ‌و هەستی پێ ناکرێ.
**indiscreet** (in′dis-krēt′), *adj.* هەڵەشە؛ دەمشڕ؛ دەم دڕاو؛ بێ سەلیقە؛ نازیر.
**indiscrete** (in′dis-krēt′), *adj.* یەك پارچە؛ جیا نەکراوە؛ ناتوانرێ جیاکرێتەوە یا پارچە پارچە بکرێ.
**indiscretion** (in′dis-kresh′ən), *n.* (١) هەڵەشەیی؛ بێ سەلیقەیی؛ دەم دڕاوی؛ نازیری. (٢) کارێکی هەڵەشە؛ کردەوەیەکی بێ سەلیقانە.
**indiscriminate** (in′dis-krim′ə-nit), *adj.* (١) بێ پاك‌و پیسی کردن؛ جیاوازی نەکەر؛ پاك‌و پیس نەکەر: ( *~ killing; an ~ reader*) .
(٢) لامسەرلا؛ بێ سەروشوێن؛ چۆن ڕێکەوت وەها.

(٣) تێکەڵ و پێکەڵ؛ شێواو؛ پەشێواو

(٤) بەرەلا؛ حور بوون؛ پاک و پیس نەکەر.

-indiscriminately *(adv.)*.

**indiscrimination** (in´dis-krim´ə-nā′shən), *n.* جیاوازی نەکردن؛ بێ جیاوازی؛ پاک و پیس نەکردن؛ بێ جیاکردنەوە لەیەک.

**indispensable** (in´dis-pen′sə-b'l), *adj.* مرۆ هەڵ ناکات بەبێ ئەوە؛ زۆر پێویست؛ ناتوانرێ دەستی لێ هەڵبگیرێ

*( Air, food, and water are ~ to life.)*

*n.* کەسێک یا شتێکی زۆر پێویست بۆ ژیان کە ناتوانرێ دەستی لێ هەڵبگیرێ.

-indispensability *(n.)*; indispensableness *(n.)*;

indispensably *(adv.)*.

**indispose** (in´dis-pōz′), *v.t.* (١) پەککەوتن؛ لەکارخستن

(٢) هەوەس کوشتن؛ ئارەزوو مراندن؛ مەیل پێ برین

(٣) نەخۆش خستن

**indisposed** (in´dis-pōzd′), *adj.* (١) نەخۆش؛ ناساغ؛ بێ تاقەت؛ نەختێک نەخۆش (٢) ناڕەدڵ؛ بێ مەیل؛ ئامادە (کارکردن، چالاکی)

**indisposition** (in´dis-pə-zish′ən), *n.* (١) نەخۆشی؛ ناساغی؛ نەخۆشییەکی کەم؛ بێ تاقەتی. (٢) بێ مەیلی؛ نابەدڵی؛ نائامادەیی.

**indisputable** (in´dis-pū′tə-b'l), *adj.* مشتومڕی ناوێ؛ گومانی لێ ناکرێ؛ بێ لێنەراو؛ بە درۆ ناخرێتەوە؛ حاشای لێ ناکرێ

*( ~ facts)*

-indisputability *(n.)*; indisputably *(adv.)*.

**indissoluble** (in´di-sol′yoo-b'l), *adj.* (١) هەڵناوەشێنرێتەوە؛ هەڵناوەشێنەوە *( an ~ contract)*

(٢) نابڕێ؛ ناکەوێ؛ ناتوێتەوە؛ نافەوتێ؛ لەناوناچێ؛ پتەو؛ لەناونابرێ

**indistinct** (in´di-stiŋkt′), *adj.* (١) کز؛ لێڵ؛ دەنگ نەبیستراو؛ نەدیار؛ باش نەبینراو؛ ناڕوون (٢) دیاری نەکراو؛ جیا نەکراوە؛ نیشان نەکراو.

**indistinctive** (in´di-stiŋk′tiv), *adj.* (١) جیا نییە لە شتی تر؛ بێ تایبەتی؛ هیچی تایبەتی نییە (٢) پاک و پیس ناکات؛ جیاوازی نەکەر.

**indistinguishable** (in´di-stiŋ′gwish-ə-b'l), *adj.* (١) جیا ناکرێتەوە لەوانی تر؛ جیا ناکرێتەوە؛ بێ تایبەتی؛ نیشان نەکراو

(٢) هەست پێ نەکراو؛ کەم؛ کز

**indite** (in-dīt′), *v.t.* (١) هەڵبەستن؛ دانان؛ نووسین (هۆنراوە، پەخشان)

*( to ~ a poem)*

(٢) نووسین

(٣) [Obs.] پێ نووسینەوە؛ پێ وتن

-inditement *(n.)*.

**indium** (in′di-əm), *n.* کانزایەکی نەرمی ڕەنگ زیوییە

**indivertible** (in´di-vūr′tə-b'l), *adj.* لە ڕێگە لانادرێ؛ لانادرێ؛ ڕێی پێ ناگۆڕدرێ

**individual** (in´də-vij′oo-əl), *adj.* (١) جیا ناکرێتەوە؛ یەک پارچە؛ بەش بەش نەکراو (٢) جیا؛ تایبەتی؛ جیاواز

(٣) کەسی؛ یەک کەسی؛ تایبەتی بە یەک کەس؛ تایبەتی بە یەک شت

*( to give ~ attention to each student:*
*The children have their own ~ rooms.)*

(٤) تایبەتی؛ تایبەتی بە خۆ؛ جیا لە خەڵکی تر

*( an ~ style of speaking, dressing, etc.)*

*n.* (١) بوونەوەرێکی جیا؛ شتێک؛ بوونەوەرێک؛ یا کۆمەڵێکی تایبەتی.

(٢) کەس؛ کەسێک؛ ئادەمی؛ مرۆ؛ یەکێک؛ یەک کەس

*( an ~ ; Two ~s walked in. :*
*the rights of the ~ as opposed to the rights of society as a whole)*

(٣) کەسێکی سەربەخۆ و گوێ لە کەس نەگر

**individualism** (in´də-vij′oo-əl-iz'm), *n.* (١) سەربەخۆیی مرۆ؛ گوێ نەدان بە کەسی تر؛ تاکرەوی (٢) تایبەخۆی کەسێک؛ کەسێتی؛ کەسی. (٣) فەلسەفەیەکە دەڵێت: کە سەربەستی و خۆش گوزەرانی و مافی مرۆ لەپێش هی کۆمەڵەوە دێت (٤) فەلسەفەیەکە کە دەڵێت فەرمانڕەوایی و کۆمەڵ بۆ خزمەتی مرۆ پەیدابوون نەک بە پێچەوانەوە (٥) مـن مـنۆکی

**individualist** (in´də-vij′oo-əl-ist), *n.* کەسێکی سەربەخۆ؛ کەسێک کە ڕێبازی خۆی دەگرێ لە ژیانداو شوێنی هیچ کۆمەڵەو دەستەو حیزبێک ناکەوێ؛ تاکرەو.

-individualistic *(adj.)*.

**individuality** (in´də-vij´oo-al′ə-ti), *n.* (١) تایبەخۆیی کەسێک یا شتێک. (٢) کەسێتی؛ خۆیی؛ سەربەخۆیی مرۆ؛ سەربەستی مرۆ کە چۆن بیەوێ وەها بژی. (٣) کەسێک؛ کەس؛ مرۆ.

(٤) [Obs.]، دابەش نەبوون؛ جیا نەکراوەیی.

**individualize** (in´də-vij′oo-ə-līz´), *v.t.* (١) جیاکردنەوە.

(٢) یەک یەک سەیرکردن؛ بە جیاجیا سەیرکردن؛ تایبەتی کردن؛ گونجاندن بۆ کەسێکی تایبەتی؛ ناونووس کردن؛ نیشانەکردن.

-individualization *(n.)*.

**individually** (in´də-vij′oo-əl-i), *adv.* بە جیاجیا؛ بە جیا؛ یەکە یەکە؛ یەک یەک *( to address each person in a group ~ )*

**individuate** (in´də-vij′oo-āt´), *v.t.* جیاکردنەوە؛ تایبەخۆکردن؛ تایبەتی کردن؛ دیاری کردن

-individuation *(n.)*.

**indivisible** (in´də-viz′ə-b'l), *adj.* (١) جیا ناکرێتەوە؛ یەک پارچە؛ بەش بەش ناکرێ؛ پارچە پارچە ناکرێ. (٢) بە سەریدا بەش ناکرێ بەبێ ئەوەی تێیدا بمێنێتەوە (بیرکاری).

**Indo-** (in′dō), پێشگرێکە بەمانای: (١) هیندی.

(٢) هی هیندی و شتی تر.

**Indo-Aryan** (in′dō-âr′i-ən, in′dō-âr′yən), *adj.* (١) هیندی-ئاری؛ تایبەتی بە هیندی-ئارییەکان.

(٢) تایبەتی بە زمانە هیندی-ئارییەکان

*n.* (١) گەلێکی هیندی-ئاری. (٢) مرۆڤێکی هیندی-ئاری

**Indo-Chinese** (in´dō-chī-nēz′), *adj.* هیندی-چینی (میللەت و کلتوور).

**indocile** (in-dos′'l), *adj.* سەرکێش؛ماڵی ناکرێ؛ ماڵی نەکراو؛ بە ئاسانی ڕاناهێنرێت.

-indocility *(n.)*.

**indoctrinate** (in-dok′tri-nāt´), *v.t.* (١) فێرکردن

(٢) فێرکردنی بیروباوەڕ و تیوری فەلسەفی؛ گۆش کردن؛ دەرس دادان

-indoctrination *(n.)*; indoctrinator *(n.)*.

**Indo-European** (in´dō-yoor´ə-pē′ən), *adj.* هیندی-ئەورووپی؛ تایبەتی بە زمانە هیندی-ئەورووپاییەکان.

*n.* (١) زمانە هیندی-ئەورووپییەکان.

(٢) ئەو زمانە بنچینەییەی کە گوایە زمانە هیندی-ئەورووپییەکانی لێوە هاتووە.

**Indo-Germanic** (in´dō-jēr-man′ik), *adj. & n.* = Indo-European.

**Indo-Hittite** (in′dō-hit′īt), *n.* هیندی-هیتایت: ئەو زمانە بنچینەییەی گوایە زمانە هیندی-ئەورووپییەکان و زمانە هیتایتەکانی لێوە هاتووە.

**Indo-Iranian** (in′dō-ī-rā′ni-ən), *adj.* هیندی-ئێرانی: تایبەتی بە زمانە هیندی-ئێرانییەکان (کوردی و فارسی بەشێکن لەم لقەی زمانە هیندی-ئەورووپییەکان).

**indolence** (in′də-ləns), *n.* تەمەڵی؛ پاڵ لێدانەوە؛ حەز لە ئیش نەکردن.

**indolent** (in′də-lənt), *adj.* (١) تەمەڵ؛ حەز لە ئیش نەکەر؛ سست.

(٢) بێ ئازار (پزیشکەوانی) *( an ~ cyst)*.

**indomitable** (in-dom′i-tə-b'l), *adj.* نەبەز؛ نەبەزیو؛ نابەزێ؛

نابەزینری ناشکینری' مل شۆڕ نەکەر؛ سەربەرز:
*( an ~ spirit, people, etc.)*

**Indonesian** (in´dō-ne′zhən), *adj.* (١) ئیندۆنیزی' تایبەتی بە ئیندۆنیزیا و گەلەکەی. (٢) تایبەتی بە یەکێك لە زمانەکانی ئیندۆنیزیا و فیلیپین و جاوە... هتد
*n.* (١) ئیندۆنیزی' کەسێکی ئیندۆنیزیایی' هاوولاتی‌یەکی ئیندۆنیزیا. (٢) زمانە ئیندۆنیزیایی‌یەکان

**indoor** (in′dôr´, in′dōr´), *adj.* (١) ناوماڵ' هی ناوماڵ' ژوورەوە. *( an ~ pool; ~ plumbing)* (٢) لەناوماڵدا ڕوودەدات؛ ناوماڵی: *( an ~ party)*.

**indoors** (in´dôrz′, in´dōrz′), *adv.* بۆ ژوورەوە؛ لە ژوورەوە' لەناوماڵدا' ناوماڵ. *( let's go ~ .)*

**indubitable** (in-dū′bi-tə-b'l), *adj.* گومانی لێ ناکرێ' گومانی تێدا نی‌یە

**induce** (in-do͞os′, in-dūs′), *v.t.* (١) پێ سەلماندن؛ سازاندن؛ دڵ پێ داهێنان. (٢) بوون بە هۆ؛ والێکردن؛ هاندان؛ پاڵ پێوەنان: *( to ~ sleep, labor, etc.; indigestion ~d by overeating)* (٣) گەیشتن بە ئەنجامی گشتی لەڕێی بەشەکانەوە؛ بە ئەنجام کردن؛ ئەنجام بۆ دەرکەوتن.

**inducement** (in-dūs′mənt), *n.* (١) پێ سەلماندن؛ دڵ پێ داهێنان؛ سازاندن. (٢) هاندەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ پاڵ' هانەهان؛ بەرتیل (مەجان)؛ دڵ پێ داهێنەر. (٣) پێشەکی داوا ڕوونکردنەوە (دادگەری).

**induct** (in-dukt′), *v.t.* (١) هێنانەبەر بار. (٢) دانان بە کاربەدەستێکی گەورە یا فەرمانڕەوا بە ئاهەنگەوە. (٣) کردن بە ئەندام لە کۆمەڵەیەکدا؛ ڕاهێنان: *( to ~ into an organization)* (٤) کردن بە سەرباز: *( He was ~ed into the army.)*. (٥) بە ئەنجامی گشتی گەیشتن لەڕێی بەشەکانەوە

**inductee** (in-duk´tē′), *n.* (١) ئەندامی تازەی کۆمەڵەیەك (٢) سەربازێکی تازە گیراو (٣) کاربەدەستێکی گەورەی تازە دانراو

**inductile** (in-duk′t'l), *adj.* (١) نەرم نی‌یە' ناکشێنرێ و تەنك ناکرێ و ناکرێ بە پەڕەی تەنك (کانزا). (٢) سەرکێش؛ ملنەدەر.
**-inductility** *(n.)*.

**induction** (in-duk′shən), *n.* (١) دانان بە فەرمانڕەوا بە ئاهەنگەوە (٢) کردن بە ئەندامی تازەی کۆمەڵەیەك (٣) کردن بە سەرباز؛ سەرباز گرتن: *( ~ into the army; an army ~ center)* (٤) (أ) بە ئەنجامی گشتی گەیشتن لەڕێی بەشەکانەوە (ژیربێژی). (ب) ئەم ئەنجامە گشتی‌یە. (٥) [Archaic] پێشەکی هۆنراوە، چیرۆك، یا شانۆنامەیەك. (٦) پەیداکردنی ئەلەکتریك یا موگناتیس لە ئامێرێکدا لەڕێی نزیکبوونی لە سەرچاوەی ئەلەکتریك یا موگناتیسەکەوە بەبێ ئەوەی لەیەکتر بکەون (فیزیا).

**inductive** (in-duk′tiv), *adj.* (١) پاڵ پێوەنەر' هاندەر' جوار و سەمێنەر. (٢) (أ) تایبەتی بە گەیشتنە ئەنجامی گشتی لەڕێی بەشەکانەوە (ژیربێژی) *( ~ reasoning, method, etc.)*. (ب) بەم جۆرە بیرکردنەوەیە بە ئەنجام هێنراوە (٣) سەرەتایی یا پێشەکی (هۆنراوە، چیرۆك، شانۆنامە).

**inductor** (in-duk′tēr), *n.* (١) دانەری کەسێك بە فەرمانڕەوا. (٢) ئامێری ئەلەکتریك گەیێنەر.

**indulge** (in-dulj′), *v.t.* (١) بەر بۆ ئارەزوو بەرەڵاکردن؛ ڕێ پێدان؛ بەر بۆ ئارەزوو بەردان. (٢) بەدەمەوەدان؛ جڵەو بۆ شل کردن؛ نازکێشان' لاوندنەوە *( He ~s his children too much.)*. (٣) لە گوناە خۆشبوون (ئاینی کاسۆلیکی) (٤) [Obs.]. چاکە لەگەڵ کردن' پیاوەتی لەگەڵ کردن. (٥) ماوەی قەرزدانەوە بۆ درێژکردنەوە.
*v.i.* ( ~ in ), جڵەو بۆ خۆ شل کردن؛ بەر بۆ خۆ بەردان؛ بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن؛ شوێن ئارەزوو کەوتن: *( to ~ in drinking, eating, idle thoughts, etc.)*

**indulgence** (in-dul′jəns), *n.* (١) بەر بۆ بەرەڵاکردن؛ بەدەمەوەدان؛ بەر بۆ ئارەزوو بەردان؛ جڵەو بۆ شل کردن. (٢) ئەوەی کە بەری ئارەزووی بۆ بەرەڵا دەکرێ. (٣) جڵەو بۆ خۆ شل کردن؛ سەرتێکردن؛ شوێن ئارەزوو کەوتن (٤) چاکە' پیاوەتی. (٥) ماوە پێدان بۆ قەرزدانەوە. (٦) بەخشین؛ لە گوناە خۆشبوون (ئاینی کاسۆلیکی)

**indulgent** (in-dul′jənt), *adj.* بەر بەرەڵاکەر' جڵەو زۆر شل کەر؛ دڵنەرم؛ زۆر بەدەمەوەدەر' زۆر شوێن ئارەزووی خۆو خەڵك کەوتوو؛ نازکێش *( an ~ parent, teacher, etc.)*

**indurate** (in′doo-rāt´, in′dyoo-rāt´), *v.t.* (١) ڕەق کردن. (٢) دڵڕەق کردن' هەست مراندن؛ کەللەڕەق کردن
*adj.* (١) ڕەق' ڕەق بوون. (٢) دڵڕەق؛ هەست مردوو؛ هەست مرێنراو؛ کەللەڕەق' سەرسەخت

**industrial** (in-dus′tri-əl), *adj.* پیشەسازی؛ هی پیشەسازی.
*n.* (١) پیشەگەر؛ کرێکاری کارگەیەك. (٢) کۆمپانیایەکی پیشەسازی (٣) (*pl.*) کومپیالەوقەوالەی دارایی کە کۆمپانیایەکی پیشەسازی دەریدەکات

**industrial arts,** هونەری پیشەسازی (قوتابخانە).

**industrialism** (in-dus′tri-əl-iz'm), *n.* پیشەسازێتی؛ خەریك بوون و پشت پێوەبەستنی کۆمەڵێك بە پیشەسازی‌یەوە

**industrialist** (in-dus′tri-əl-ist), *n.* پیشەساز' خاوەن کارگە؛ پیشەسازێکی گەورەو بەدەسەڵات.

**industrialization** (in-dus´tri-əl-i-zā′shən), *n.* پەرەسەندنی پیشەسازی لە وڵاتێکدا' پەرە پێ سەندنی پیشەسازی؛ بڵاوبوونەوەی پیشەسازی

**industrialize** (in-dus′tri-əl-iz´), *v.t.* پەرە پێ سەندنی پیشەسازی لە وڵاتێکدا' پیشەسازی دانان و برەوپێدانی: *( to ~ a country, region, etc.)*

**industrially** (in-dus′tri-əl-i), *adv.* لەڕووی پیشەسازی‌یەوە

**Industrial Revolution,** شۆڕشی پیشەسازی

**industrial school,** قوتابخانەی پیشەسازی

**industrious** (in-dus′tri-əs), *adj.* (١) کارامە؛ زیرەك' شارەزا' لێزان. (٢) کۆششکەر' زۆر ئیشکەر؛ زۆر هەوڵدەر؛ بەچنگ: *( an ~ student, farmer, worker, person, etc.)*

**industry** (in′dəs-tri), *n.* (١) زیرەکی؛ شارەزایی؛ کارامەیی' لێزانین. (٢) کۆشش؛ هەوڵ' زۆر هەوڵدان *( His success was due to ~ and thrift.)* (٣) هەمیشە ئیشکردن' بێکار نەبوون (٤) پیشەسازی (٥) لقێکی پیشەسازی *( the paper ~ ; the motion-picture ~ )* (٦) پیشەسازان' خاوەن و بەڕێوەبەرانی پیشەسازی

**indwell** (in´dwel′), *v.i. & v.t.* تێدا ژیان؛ تێدابوون

**-ine** (in, in, ēn), پاشگرێکە بەمانای وەك' لێچوو *( crystalline )*.

**-ine** (in, in, ēn), پاشگرێکە ناوی مێینەی لێ درووست دەکرێ *( heroine )*

**-ine** (in), پاشگرێکە ناوی ڕووتی لێ درووست دەکرێ: *( doctrine, medicine )*

**-ine** (en, in, īn), پاشگرێکە ناوی کیمیایی لێ درووست دەکرێ. *( vaseline, iodine )*

**inebriant** (in-ē′bri-ənt), *adj.* سەرخۆشکەر
*n.* خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەر

**inebriate** (in-ē′bri-āt´), *v.t.* (١) سەرخۆش کردن

(٢) هێنانە حوش، شادکردن؛ شەیداکردن

*adj.* سەرخوش

*n.* کەسێکی هەمیشە سەرخوش؛ کەسێکی سەرخوش

**inebriated** (in-ē′bri-āt′id), *adj.* سەرخوش

**inebriation** (in-ē′bri-ā′shən), *n.* سەرخوشی

**inebriety** (in′i-brī′ə-ti), *n.* سەرخوشی

**inedible** (in-ed′ə-b′l), *adj.* ناخورێت، بەکەڵکی خواردن نایەت

**ineffable** (in-ef′ə-b′l), *adj.* (١) بە دەم باس ناکرێ؛

لە وەسف کردن نایەت، لە باسکردن نایەت: *( ~ delight, beauty, etc.)*.

(٢) ناوی ناهێنرێت لەبەر بەشکۆیی و پیرۆزی؛ *( God's ~ name)*.

-ineffability *(n.)*; ineffably *(adv.)*.

**ineffaceable** (in-i-fās′ə-b′l), *adj.* ناسڕرێتەوە، ناکوژێنرێتەوە؛

ناکوژێتەوە، هەتاهەتایی: *( an ~ impression)*

**ineffective** (in′ə-fek′tiv), *adj.* (١) بێ کەڵک، بێ ئەنجام؛ بێ سوود،

ناکاریگەر *( ~ efforts)*

(٢) لێ نەهاتوو، ناکارامە؛ بێ توانا؛ هیچ لەبارا نەبوو؛ نابەکار؛ چرووك؛

سەرنەکەوتوو *( an ~ leader)*

-ineffectively *(adv.)*; ineffectiveness *(n.)*.

**ineffectual** (in′ə-fek′choo-əl), *adj.* بێ ئەنجام، بێ کەڵك؛

بێ سوود؛ سەرنەکەوتوو، ناکاریگەر

**inefficacious** (in′ef-i-kā′shəs), *adj.* بێ کەڵك، بێ سوود،

ناکاریگەر، بێ ئەنجام

**inefficacy** (in-ef′i-kə-si), *n.* بێ کەڵکی، بێ سوودی، بێ ئەنجامی؛

ناکاریگەری

**inefficiency** (in′ə-fish′ən-si), *n.* ناکارامەیی، ناکاریگەری،

ناچالاکی، لێ نەهاتوویی

**inefficient** (in′ə-fish′ənt), *adj.* (١) بێ ئەنجام، بێ سوود،

بێ کەڵك (٢) باش بەڕێوەنەبراو؛ کات و ورزە و پارە بەفیڕۆدەر، ناکاریگەر:

*( an ~ system)*

(٣) لێ نەهاتوو، ناکارامە؛ لێ نەزان؛ بێ توانا؛ چرووك *( an ~ worker)*

**inelastic** (in′i-las′tik), *adj.* ڕەق؛ نالاستیکی؛ نانوشتێتەوە

-inelasticity *(n.)*.

**inelegance** (in-el′ə-gəns), *n.* (١) ناتەڕپۆشی؛ نەناسکی،

ناشۆخ و شەنگی (٢) ناشیرینی (زمان، ڕەفتار)؛ بێ نەزاکەتی

**inelegant** (in-el′ə-gənt), *adj.* (١) ناتەڕپۆش، نەناسك؛

ناشۆخ و شەنگ: *( an ~ woman)*

(٢) ناشیرین (زمان، ڕەفتار، کردەوە)؛ بێ نەزاکەت

**ineligible** (in-el′i-jə-b′l), *adj.* نەشیاو بۆ کاربەدەستییەك یا

فرمانێك؛ شایستەی هەڵبژاردن نییە.

*n.* کەسێکی نەشیاو بۆ هەڵبژاردن بۆ شتێك.

-ineligibility *(n.)*.

**ineloquent** (in-el′ə-kwənt), *adj.* زمان ناپاراو، بێ دەمویل

-ineloquence *(n.)*.

**ineluctable** (in′i-luk′tə-b′l), *adj.* دەربازبوونی لەدەست نییە؛

لەدەست دەرچوونی نییە، هەر نەبێ بێ *( ~ fate)*

**inept** (in-ept′), *adj.* (١) نەشیاو، نەگونجاو؛ بەکارنەهاتوو،

بەکەڵك نەهاتوو، نابەجێ *( an ~ comparison)*

(٢) کەرانە (وتە، مشتومڕ، گفتوگۆ)؛ بێ مێشکانە؛ بێ مانا:

*( an ~ argument, remark, conversation, etc.)*

(٣) ناکارامە؛ لێ نەهاتوو؛ هیچ لەبارا نەبوو؛ بێ توانا؛ لێ نەزان؛ نەشارەزا؛

نالەبار؛ بێ دەسەڵات؛ دەسەپاچە:

*( an ~ official, carpenter, worker, etc.)*

-ineptly *(adv.)*; ineptness *(n.)*.

**ineptitude** (in-ep′tə-tōōd′, in-ep′tə-tūd′), *n.* (١) نەشیان،

نەگونجان، نابەجێیی (٢) بێ مێشکی، بێ مانایی؛ کەرێتی.

(٣) ناکارامەیی؛ لێ نەزانین؛ نەشارەزایی؛ نالەباری؛ دەسەپاچەیی؛ بێ توانایی

(٤) کارێك، وتەیەك، یا ڕەفتارێکی نابەجێ و ناپەسەند.

**inequality** (in′i-kwäl′ə-ti, in′i-kwôl′ə-ti), *n.* (١) ناهاوتایی؛

نایەکسانی (٢) (ا) جیاوازی (قەبارە، پلە، ڕادە، چۆنێتی، پلەوپایەی

کۆمەڵایەتی)، (ب) ئەوەندەی یەك نەبوون. (ج) ناهەقی، ناڕەوایی.

(٣) ناهاوتایی دوو ژمارە (بیرکاری).

**inequation** (in′i-kwā′zhən, in′i-kwā′shən), *n.* ناهاوتایی

دوو ژمارە (بیرکاری).

**inequitable** (in-ek′wi-tə-b′l), *adj.* نایەکسان؛ ناڕەوا؛ ناهەق.

-inequitably *(adv.)*.

**inequity** (in-ek′wi-ti), *n.* ناڕەوایی؛ ناهەقی؛ نایەکسانی؛ لایەنگری؛

لاسەنگی؛ ستەمکاری

**ineradicable** (in′i-rad′i-kə-b′l), *adj.* ڕیشەکێش ناکرێ؛

لە ڕەگ دەرنایەت؛ نافەوتێنرێ؛ لەناونابرێ؛ بنبڕ ناکرێ.

**inerasable** (in′i-rās′ə-b′l), *adj.* ناسڕرێتەوە؛ ناکوژێتەوە.

**inerrant** (in-er′ənt, in-ûr′ənt), *adj.* هەڵە ناکات؛ لە هەڵە بەدوور

**inert** (in-ûrt′), *adj.* (١) بێ گیان؛ نەبزوێ: *( ~ matter)*.

(٢) سست؛ ناچالاك؛ خاو؛ تەمەڵ. (٣) کارناکاتە هیچ شتێك (کیمیا، دەرمان)

**inertia** (in-ûr′shə), *n.* (١) بار نەگۆڕین؛ نەبزوان؛ نەجووڵان؛ بێ تینی.

(٢) بێ گیانی؛ سستی؛ تەمەڵی؛ بێ تاقەتی؛ هیچ نەکردن.

-inertial *(adj.)*.

**inescapable** (in′ə-skāp′ə-b′l), *adj.* دەربازبوونی لە دەست نییە،

هەر ئەبێ ببێ؛ هەر ڕوودەدات

**inessential** (in′ə-sen′shəl), *adj.* پێ نەویست؛ ناپێویست؛

ناگرنگ.

*n.* شتێکی پێ نەویست.

**inestimable** (in-es′ti-mə-b′l), *adj.* (١) هەڵناسەنگێنرێ؛

نازمێررێ؛ نرخەکەی نازانرێ، ناپێورێ: *( ~ damage)*.

(٢) زۆر بەنرخ؛ نرخی لەسەر دانانرێ لەبەر زۆر بەنرخی: *( ~ advice)*.

-inestimably *(adv.)*.

**inevitability** (in′ev-i-tə-bil′ə-ti), *n.* مسۆگەر ڕوودانی شتێك؛

بێ گومانی ڕوودانی شتێك؛ ناچاری ڕوودانی شتێك.

**inevitable** (in-ev′i-tə-b′l), *adj.* هەر ئەبێ ببێ؛ هەر ڕوودەدات؛

هەر دەبێت؛ لە دەست دەربازبوونی بۆ نییە؛ بە ناچاری هەر دەبێت

-inevitably *(adv.)*.

**inexact** (in′ig-zakt′), *adj.* ڕاست نییە؛ هەڵە؛ ناتەواو؛ ورد نییە.

-inexactitude *(n.)*.

**inexcusable** (in′ik-skūz′ə-b′l), *adj.* نابەخشرێ؛ لێبووردنی بۆ

نییە؛ شایستەی بەخشین نییە؛ نابێ ببەخشرێ یا ببوورێ؛ ناڕەوا؛ بێ بەڵگە

*( an ~ mistake, delay, oversight, etc.)*

-inexcusably *(adv.)*; inexcusability *(n.)*.

**inexhaustible** (in′ig-zôs′tə-b′l), *adj.* (١) لەبن نایەت؛

تەواو نابێ؛ دوایی نایەت؛ لەبن نەهاتوو:

*( an ~ supply of food, water, good feelings, etc.)*

(٢) ماندوو نابێ؛ ماندووبوونی بۆ نییە.

-inexhaustibly *(adv.)*; inexhaustibility *(n.)*.

**inexistent** (in′ig-zis′tənt), *adj.* بوونی نییە؛ نییە؛

لە جیهاندا نییە.

**inexorable** (in-ek′sẽr-ə-b′l), *adj.* بێ ئامان؛ دڵنەرم نابێ؛ دڵڕەق؛

بێ ڕەحم؛ وازناهێنێ؛ لە ڕێ لانادات؛ کۆڵنەدەر؛ ملنەدەر؛ سەرسەخت؛

کەللەڕەق؛ گوێ لە هیچ نەگر؛ ناگۆڕێ.

-inexorably *(adv.)*; inexorability *(n.)*.

**inexpedient** (in′ik-spē′di-ənt), *adj.* نەشیاو؛ نەگونجاو؛

بەکارنەهاتوو؛ بەکەڵك نەهاتوو؛ نابەجێ؛ ناژیرانە.

-inexpedience *(n.)*; inexpediency *(n.)*.

**inexpensive** (in´ik-spen′siv), *adj.* هەرزانـەها٠ هەرزان
**inexperience** (in´ik-spêr′i-əns), *n.* نەشارەزایی٠ لێ نەزانین؛ نەزانی٠ قاڵ نەبوون٠ ناقاڵی؛ تازەکوورەیی؛ دنیا نەدیدەیی.
**inexperienced** (in´ik-spêr′i-ənst), *adj.* نەشارەزا؛ لێ نەزان٠ تازە کوورە٠ هەرزە٠ نەزان٠ قاڵ نەبوو؛ دنیا نەدیدە
**inexpert** (in´ik-spûrt′, in-ek′spērt), *adj.* نەشارەزا؛ لێ نەزان٠ نەزان٠ قاڵ نەبوو
-inexpertly *(adv.).*
**inexpiable** (in-ek′spi-ə-b'l), *adj.* (١) ناسڕێتەوە (تاوان، گوناه) لێخۆشبوونی نییە *(an ~ sin)*.
(٢) [Archaic] دانامرکێتەوە؛ سارد نابێتەوە؛ دڵی نەرم نابێ؛ ناگۆڕێ:
*(~ vengeance)*
**inexplainable** (in´iks-plān′ə-b'l), *adj.* ڕوون ناکرێتەوە٠ هۆکەی ڕوون ناکرێتەوە٠ ڕوون نەکراوە
**inexplicable** (in-eks′pli-kə-b'l), *adj.* هۆکەی ڕوون ناکرێتەوە٠ ڕوون ناکرێتەوە؛ ڕوون نەکراوە٠ تێگەیشتنی هۆکەی گرانە.
-inexplicability *(n.)*; inexplicably *(adv.).*
**inexplicit** (in´iks-plis′it), *adj.* ناڕوون٠ نائاشکرا٠ نادیار؛ لێڵ
**inexpressible** (in´iks-pres′ə-b'l), *adj.* دەرنابڕێ٠ دەس ناکرێ٠ ناتوانرێ بووترێ یا دەربڕدرێ: *(~ joy)*
**inexpressive** (in´iks-pres′iv), *adj.* (١) ووشەی بێشوو بینە
(٢) دەرنەبڕ٠ نادەربڕ؛ بێ مانا٠ هیچ پیشان نەدەر
**inexpugnable** (in´ik-spug′nə-b'l), *adj.* نابەزێنرێ٠ دەگیرێ٠ ناشکێنرێ٠ دەگیر ناکرێ٠ ملی پێ شۆڕ ناکرێ؛ سەخت
**inextinguishable** (in´ik-stiŋ′gwish-ə-b'l), *adj.* ناکوژێتەوە٠ ناکوژێنرێتەوە؛ دانامرکێتەوە؛ ناوەستێنرێ؛ دوایی پێ نایەت:
*(~ fire, flame, spirit, etc.)*
**inextirpable** (in´ik-stûr′pə-b'l), *adj.* نافەوتێنرێ٠ دوایی پێ نایەت٠ لە ڕەگ و ڕیشە دەرنایەت
**in extremis** (in iks-trē′mis), (١) لە سەردەمەرگدا
(٢) لە کاتی تەنگوچەڵەمەدا.
**inextricable** (in-eks′tri-kə-b'l), *adj.* (١) لە دەست دەربازبوونی نییە٠ لێ ڕزگار بوونی نییە٠ لە دەست دەرچوونی نییە.
*(an ~ maze, quandary, etc.)*
(٢) (أ) ئاڵۆز٠ ئاڵۆسکاو؛ ئاڵۆزاو (تەنگوچەڵەمە، گرێ:
(ب) بێ چارە٠ چارەسەری نییە
(٣) (أ) لێی دەرنایەت؛ لێی جیاناکرێتەوە؛ چەسپیو
*(The screws were rusted in and quite ~)*
(ب) هەڵنەوەشێتەوە؛ جیا نابێتەوە: *(an ~ relashionship)*.
-inextricability *(n.)*; inextricableness *(n.)*;
inextricably *(adv.).*
**infallible** (in-fal′ə-b'l), *adj.* (١) هەڵەنەکەر٠ ڕاست٠ لە هەڵە بەدوور: پشت پێ بەستراو *(an ~ man, source of information, etc.)*.
(٢) باش و چارەکەر (دەرمان)؛ کاریگەری مسۆگەرە *(an ~ antidote)*.
(٣) لە هەڵە بەدوور (بەتایبەتی پاپا دەربارەی شتی ئاینی)؛ لە هەڵە و گوناه بەدوور٠ هەڵەنەکەر٠ بێ هەڵە.
*n.* کەسێک یا شتێکی هەڵەنەکەر یا لە هەڵە بەدوور
-infallibility *(n.).*
**infamous** (in′fə-məs), *adj.* (١) بەدناو٠ ناوخراپ٠ ناوبانگ خراپ؛ ناوزڕاو *(an ~ person, place, etc.)*
(٢) ناپەسەند٠ پیس (کردەوە، کردار)٠ شوورەیی؛ زۆر خراپ. *(an ~ deed)*.
(٣) (أ) سزای بەندیخانەیە (تاوان)؛ (ب) سزادراو؛ تاوانبار
**infamy** (in′fə-mi), *n.* (١) بەدناوی٠ ناپەسەندی؛ ناوخراپی؛ ناوبانگ خراپی٠ خراپی. (٢) کردەوەیەک یا کارێکی زۆر خراپ و ناپەسەند؛ شوورەیی (٣) ماف لێ سەندنەوەی تاوانبارێک.
**infancy** (in′fən-si), *n.* (١) ساوایەتی؛ ساوایی؛ کۆرپەیی؛ منداڵی.
(٢) سەرەتا؛ ساوایی: *(Flying is no longer in its ~.)*.
(٣) کاتی منداڵی و هەرزەیی (تا تەمەنی بیست ویەکساڵی).
**infant** (in′fənt), *n.* (١) منداڵی ساوا٠ شیرەخۆرە؛ بەرمەمکانە؛ مەلۆتکە؛ منداڵی کۆرپە. (٢) منداڵ (لە بیست ویەک کەمتر)؛ هەرزە
*adj.* (١) بۆ منداڵی ساوا؛ تایبەتی بە منداڵی ساوا یا کۆرپە
(٢) زۆر زوو؛ لە سەرەتاوە؛ لە قۆناغی یەکەم یا لە سەرەتاوە.
**infanticide** (in-fan′tə-sīd´), *n.* (١) منداڵی ساوا کوشتن.
(٢) منداڵی ساوا کوژ.
**infantile** (in′fən-tīl´, in′fən-til), *adj.* (١) تایبەتی بە منداڵی ساوا یا ساوایی (٢) منداڵانە (کردار، کردەوە، ڕەووشت): *(~ behavior)*
(٣) لەکاتی ساوایی یا منداڵیدا٠ هی سەرەتا؛ سەرەتایی.
**infantilism** (in-fan′tə-liz'm), *n.* (١) هەر بە منداڵی مانەوە و گەورە نەبوون نە لە لەش و نە لە مێشکداو بلووق نەبوون (نەخۆشی ناسی)؛ هەر بە منداڵێتی مانەوە (٢) کردەوە یا کردارێکی منداڵانە.
**infantine** (in′fən-tīn´, in′fən-tin), *adj.* = infantile.
**infantry** (in′fən-tri), *n.* لەشکری پیادە؛ پیادە (سەرباز)
**infantryman** (in′fən-tri-mən), *n.* سەربازی پیادە
**infatuate** (in-fach′ōō-āt´), *v.t.* (١) هۆش لەبەر نەهێشتن٠ شێت کردن٠ مێشک نەهێشتن (٢) دڵفڕاندن؛ هێنانە جۆش؛ شەیداکردن (خۆشەویستی).
*adj. & n.* شێتوشەیدا؛ حەزلێکەر؛ دڵفڕێنراو.
**infatuated** (in-fach′oo-āt´id), *adj.* شێتوشەیدا؛ حەزلێکەر؛ دڵفڕێنراو: *(He is ~ with her.)*.
**infatuation** (in-fach´ōō-ā′shən), *n.* شێتوشەیدایی؛ حەز؛ حەزلێکردن؛ دڵفڕان
**infeasible** (in-fē′zə-b'l), *adj.* نەکردەنی٠ ناکرێ؛ نەکراو؛ دەست نادات؛ سەرناگرێ.
-infeasibility *(n.).*
**infect** (in-fekt′), *v.t.* (١) پیس کردن بە میکرۆب؛ میکرۆباوی کردن.
(٢) تووشی نەخۆشی کردن٠ نەخۆشی پێ گەیاندن
(٣) خراپ کردن؛ تێکدان؛ پیس کردن.
(٤) پێ گەیاندن (ترس، ئازایی، چاکی، خراپی) *(His fear ~ed us all.)*.
**infection** (in-fek′shən), *n.* (١) نەخۆش کەوتن٠ تووشی نەخۆشی بوون؛ بریندار بوون (٢) نەخۆشی؛ برینداری
(٣) میکرۆب یا شتێکی نەخۆشی تووشکەر. (٤) نەخۆشییەکی تووشکەر
(٥) تووش بوون یا پێ گەیاندن (بیروباوەڕ، هەست).
**infectious** (in-fek′shəs), *adj.* (١) دەبێتە هۆی نەخۆشی.
(٢) لە کەسێکەوە تووشی کەسێکی تر دەبێت (نەخۆشی)؛ تێپەڕ؛ پەڕۆک؛ بەتەشەنە: *(an ~ disease)*
(٣) بڵاودەبێتەوە؛ بەئاسانی بە خەڵکی تر دەگات: *(an ~ laugh)*
(٤) [Obs.] نەخۆش.
**infective** (in-fek′tiv), *adj.* = infectious.
**infelicitous** (in´fə-lis′ə-təs), *adj.* (١) ناخۆش (دەنگوباس)؛ خەمبار؛ دڵتەنگ؛ بەدبەخت؛ بەدووم؛ بەیووم. (٢) نابەجێ؛ نەشیاو؛ نەگونجاو
**infelicity** (in´fə-lis′ə-ti), *n.* (١) ناخۆشی؛ خەمباری؛ دڵتەنگی؛ بەدبەختی (٢) نابەجێیی؛ نەشیاوی؛ نەگونجاوی؛ نەگونجان.
(٣) کردەوە، کردار، یا ووتەیەکی نابەجێ.
**infer** (in-fûr′), *v.t.* (١) بوون بە هۆ؛ والێکردن
(٢) بۆ دەرکەوتن؛ هەڵهێنان؛ ئەنجام لێ دەرهێنان؛ ئەنجام لێوە وەرگرتن؛ تێگەیشتن. *(to ~ an unknown fact from a known fact; I ~ed from what he said that he disagreed with me.)*
(٣) وا دەرخستن٠ نیشانەی ئەوە بوون
*v.i.* بۆ دەرکەوتن؛ ئەنجام دەرهێنان
**inference** (in′fēr-əns), *n.* (١) لێوە وەرگرتن٠ بۆ دەرکەوتن؛ هەڵهێنان؛

ئەنجام بۆ دەرکەوتن *( to find out by ~ )*

(٢) ئەنجام بۆ دەرکەوتنێك؛ بۆ دەرکەوتوو

*( Is that a fair ~ from my statement?)*

**inferential** (in´fə-ren′shəl), *adj.* تایبەتی بە ئەنجام دەرهێنان یا دەرکەوتن لە شتێکەوە.

**inferior** (in-fêr′i-ẽr, in-fêr′yẽr), *adj.* (١) خوارتر؛ خواروتر

(٢) پلەوپایە خوارتر؛ پلە نزمتر؛ پلە کەمتر؛ نزم (پلە)؛ بەردەست؛ خواردەست.

(٣) بازاڕی؛ ڕەشۆکی؛ گەنگ؛ لێ نەهاتوو؛ بێ فەڕ؛ ناتەواو.

(٤) ( to ) خراپتر لە؛ بێ بایەختر؛ ئەوەندەی ئەو باش نییە.

(٥) لە ژێرەوە ڕواو (ڕووەکناسی)

(٦) لە ژێر هێڵەکەوە نووسراو یا چاپکراو.

*n.* (١) کەسێکی لێ نەهاتوو، پلەوپایە نزم، بەردەست، یا کەم بایەخ

(٢) شتێکی بازاڕی یا ڕەشۆکی.

(٣) تیپ، نیشانە، یا سەروبۆری ژێر هێڵ

**inferiority** (in-fêr´i-ôr′ə-ti, in´fêr-i-or′ə-ti), *n.* (١) پلەوپایە نزمی؛ پلە کەمی؛ پلە کەمتری. (٢) خراپی؛ کەموکووڕی

**inferiority complex,** هەست بە ناتەواوی کردن؛ خۆ بە کەم زانین؛ خۆ لە خەڵك بە کەمتر دانان؛ هەست بە کەموکووڕی کردن؛ هەستی ناتەواوی؛ هەستی کەموکووڕی

**infernal** (in-fũr′n'l), *adj.* (١) دۆزەخی؛ جەهەننەمی

(٢) ناخۆش؛ شەیتانی؛ نامرۆڤانە؛ بەلەعنەت؛ بۆ دۆزەخ دەشێت

(٣) [Colloq.] ناپەسەند؛ زۆر خراپ؛ بەدوپیس

**inferno** (in-fũr′nō), *n.* (١) دۆزەخ؛ جەهەننەم

(٢) شوێنێکی زۆر گەرم و ناخۆش

**infertile** (in-fũr′t'l), *adj.* (١) بێ بەرهەم؛ بێ بەر؛ بێ پیت؛ بێ بەرەکەت *( ~ land)*

(٢) بە پیت نەکراو *( an ~ egg)*

**infertility** (in´fẽr-til′ə-ti), *n.* بێ بەری؛ نەزۆکی؛ بێ پیتی؛ بەر نەگرتن؛ منداڵ نەبوون

**infest** (in-fest′), *v.t.* پڕبوون لە شتێکی ناپەسەند و زیانبەخش؛ تێ وەرووژان

*( mountains ~ed with robbers;*

*( buildings ~ed with rats; clothes ~ed with lice)*

**-infestation** *(n.).*

**infidel** (in′fə-d'l), *adj.* (١) بێ ئایین؛ کافر

(٢) تایبەتی بە کافر ن؛ کافری

*n.* (١) کەسێکی بێ ئایین؛ کافر؛ خوانەناسێك.

(٢) بێ بڕوا؛ کەسێك کە بڕوای بە ڕێبازێکی تایبەتی نەبێ

**infidelity** (in´fə-del′ə-ti), *n.* (١) بێ ئاینی؛ کافری؛ کافرێتی؛ خوانەناسی (٢) نادڵسۆزی؛ ناپاکی؛ بێ وەفایی

(٣) ناپاکی ژن و مێردایەتی؛ زینا؛ داوێن پیسی نێوان ژن و مێرد.

(٤) کارێکی ناپاکانە، نادڵسۆزانە، یا داوێن پیسانە

**infield** (in′fēld´), *n.* (١) زەوی و زاری نزیك بە خانووی ناو کێڵگەیەك

(٢) (أ) بەشی ناوەوەی یاریگای بێسبۆڵ (ب) یاریکەرانی ئەم بەشەی یاریگا

**infiltrate** (in-fil′trāt), *v.t. & v.i.* (١) پاڵاوتن؛ شلە

(٢) بە دزییەوە چوونە ناو بنکە یا شوێنی دوژمن

*( to ~ behind the enemy lines)*

*n.* شتێك کە لە تێشووی لەشدا کۆدەبێتەوە

**infiltration** (in´fil-trā′shən), *n.* (١) بە دزییەوە چوونەناو دوژمنەوە یا شوێنی دوژمنەوە بۆ زیان لێدان یا سووسەکردن

(٢) بە دزییەوە هەستەناوەوەی دوژمن

(٣) شتێکی پاڵێوراو؛ شتێکی کۆمەڵ بوو

**infinite** (in′fə-nit), *adj.* (١) بێ پایان؛ بێ سنوور؛ بێ ئەندازە؛ بێ شومار؛ بێ بن *( ~ space)*

(٢) زۆر زل؛ زۆر گەورە؛ یەکجار زۆر؛ لە بن نەهاتوو؛ بێ بن

(٣) بێ پایان (ژمارە، بیرکاری).

*n.* (١) شتێکی بێ سنوور یا بێ پایان (جێگە، کات).

(٢) ژمارەیەکی بێ پایان (بیرکاری).

**the Infinite (Being),** خودا.

**-infiniteness** *(n.).*

**infinitely** (in′fə-nit-li), *adv.* ئێجگار زۆر؛ بە ڕادەیەکی بێ ئەندازە:

*( This is ~ better than all the others.)*

**infinitesimal** (in´fin-ə-tes′ə-m'l), *adj.* (١) ئێجگار زۆر بچووك (ژمارە، بیرکاری). (٢) زۆر زۆر کەم؛ ئێجگار زۆر کەم یا بچووك؛ زۆر وورد؛ ئەوەندە کەمە یا بچووکە ناپێورێ

*n.* هەند، بڕ، یا ژمارەیەکی ئێجگار بچووك

**infinitive** (in-fin′ə-tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە چاووگ (ڕێزمان)؛

(٢) بێ سنوور؛ دیاری نەکراو

*n.* چاووگ (ڕێزمان)؛ سەرچاوەی کردار (ڕێزمان)؛ لە ئینگلیزیدا بریتییە لە وشەی " to " لەگەڵ کرداردا: *( to go; to think; to sing; to feel)*

**infinitude** (in-fin′ə-tōōd´, in-fin′ə-tūd´), *n.* (١) بێ پایانی؛ بێ سنووری؛ بێ بنی؛ بێ ڕادەیی (٢) ژمارە، هەند، یا ڕادەیەکی بێ سنوور

**infinity** (in-fin′ə-ti), *n.* (١) بێ پایانی؛ بێ سنووری؛ بێ ئەندازەیی.

(٢) هەتاهەتایی؛ هەتاهەتا؛ بێ پایان. (٣) ژمارەی بێ پایان (بیرکاری).

(٤) ماوەی بێ ئەندازە لە دووریدا (وێنەگرتن بە کامێرا).

**to infinity,** هەتاهەتا؛ بێ پایان

**infirm** (in-fũrm′), *adj.* (١) لاواز؛ بێ هێز؛ بێ تین.

(٢) ڕاڕا؛ دوودڵ. (٣) [Rare]، شلۆق؛ شلوشۆق.

**infirmary** (in-fũr′mə-ri), *n.* تیمارخانە (بەتایبەتی لە قوتابخانە یا نۆردوگایەکدا)؛ نەخۆشخانە.

**infirmity** (in-fũr′mə-ti), *n.* (١) لاوازی؛ بێ هێزی؛ بێ تینی

(٢) کەموکووڕی (ڕەووشت).

**infix** (in-fiks′), *v.t.* (١) تێخستن و تێدا چەسپاندن؛ تێدا قایم کردن.

(٢) لە مێشکدا چەسپ کردن؛ فێرکردن.

(٣) ناوگر یا ناوبەند خستنەناو وشەوە (زمانەوانی).

*n.* ناوبەند (زمانەوانی)؛ ناوگر.

**inflame** (in-flām′), *v.t.* (١) ئاگرتێبەردان؛ گڕتێبەردان

(٢) هێنانەجۆش؛ هەست بزواندن (بەتایبەتی تووڕەیی)

*( to ~ the crowd)*

(٣) تیژترکردن (هەست، ئارەزوو، تووڕەیی، جۆش).

(٤) ئاوساندن؛ هەوپێکردن؛ داگیرسان (برین، شکاوی)؛ هەڵئاوساندن

*v.i.* (١) هاتنەجۆش. (٢) ئاگرگرتن؛ ئاگرتێبەربوون؛ گڕتێبەربوون.

(٣) هەوکردن؛ ئاوسان؛ سووربوونەوە؛ هەڵئاوسان

**inflammable** (in-flam′ə-b'l), *adj.* (١) زوو ئاگرگر؛ زوو گڕگر؛ خۆش سووت؛ ئاگرگر؛ زوو سووت. (٢) زوو هاتەجۆش؛ زووهەڵچوو

**-inflammability** *(n.)*; **inflammably** *(adv.).*

**inflammation** (in´flə-mā′shən), *n.* (١) سووتان؛ سووتاندن؛ ئاگرگرتن؛ گڕگرتن. (٢) ئاوسان (نەخۆشی)؛ ئاوساوی؛ هەوکردن؛ سووتانەوە (نەخۆشی)؛ ئاوسان و سووربوونەوە.

**inflammatory** (in-flam′ə-tôr´i, in-flam′ə-tō´ri), *adj.* (١) هاندەر؛ هێنەرەجۆش؛ هەست بزوێنەر: *( an ~ speech)*

(٢) تایبەتی بە هەوکردن؛ ئاوساوی و سووربوونەوەی لەگەڵدایە.

**inflatable** (in-flāt′ə-b'l), *adj.* فووی تێ دەکرێ؛ هەوای تێ دەکرێ:

*( an ~ tire, tube, etc.)*

**inflate** (in-flāt′), *v.t.* (١) فووتێکردن؛ هەواتێکردن؛ پڕکردن لە هەوا؛ ئاوساندن (٢) دڵخۆش کردن؛ کەیف پێدان؛ فووتێکردن (مەجان)؛ شادی و شانازی پێدان. (٣) فیشاڵ کردن؛ فشەکردن؛ پێوەنان.

(٤) زیادکردن یا بەرزکردنەوەی بێ ئەندازە (٥) پارە زۆر خستنەناو بازارەوە

*v.i.* ئاوسان؛ باکردن؛ فووتێکران.

**-inflater** *(n.)*; **inflator** *(n.).*

**inflated** (in-flāt′id), *adj.* (١) فووتێکراو؛ ئاوساو؛ باکردوو.

(٣) فشه، پێوەنراو؛ فشەباز؛ زل (قسە).
(٣) لووت بەرز؛ ناوساو (مەجاز)؛ بە فیز؛ فووتێکراو:
*( an ~ ego; an ~ self-image)*
(٤) زۆر کراوو نرخ کەم کراوە (پارە).

**inflation** (in-flā′shən), *n.* (١) فووتێکران؛ باکردن؛ هەواتێکردن.
(٢) پارە زۆری و نرخ کەمی؛ زۆر بوون و بێ بایەخی پارە
-inflationary *(adj.)*.

**inflationist** (in-flā′shən-ist), *n.* لایەنگیرکەری پارە زۆری و نرخ کەمی (ئابووریناسی).
-inflationism *(n.)*.

**inflect** (in-flekt′), *v.t.* (١) چەماندنەوە؛ نوشتاندنەوە بۆ ناوەوە.
(٢) دەنگ بەرزو نزمکردنەوە. (٣) گۆڕینی شێوەی ووشە (ڕێزمان)؛ گەردان کردن (ژمارە چواری ووشەی دوایی ببینە)
-inflective *(adj.)*.

**inflection** (in-flek′shən), *n.* (١) چەمانەوە؛ چەمینەوە؛ نوشتانەوە.
(٢) پێچ. (٣) بەرزو نزمی دەنگ (دەنگناسی).
(٤) (أ) گۆڕینی شێوەی ووشە بۆ پیشاندانی باری کردار، ناو، یا ڕستە (ڕێزمان).
(ب) شێوەیەکی گۆڕاوی ووشە. (ج) ئەو تیپ، برگە، یا نیشانەیەی دەخرێتەسەر ووشە بۆ شێوە گۆڕینی و مانای جیا دەربڕین:
*( ship, ships, ship's, ships' ; I play, he plays, we played)*
-inflectional *(adj.)*.

**inflexibility** (in′flek-sə-bil′ə-ti), *n.* ڕەقی؛ توانای چەمانەوە یا نوشتانەوە نەبوون؛ کەللەڕەقی؛ سەرسەختی؛ نەگۆڕان.

**inflexible** (in-flek′sə-b′l), *adj.* (١) ڕەق؛ نانوشتێنەوە؛ ناچەمێتەوە. (٢) کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ سەخت؛ لە ڕای خۆ نەهاتە خوارەوە؛ ڕەنەکۆڵ. *( an ~ person, parent, teacher, etc.)* .
(٣) نەگۆڕ؛ چەسپیو. *( an ~ rule)*

**inflexion** (in-flek′shən), *n.* = inflection [British spelling]

**inflict** (in-flikt′), *v.t.* (١) (أ) تووشی ناخۆشی کردن؛ بەلا بەسەردا هێنان *( to ~ pain and suffering on people)* .
(ب) سزادان بەسەردا (دادگا) *( to ~ punishment on a defendant)* .
(٢) لێدان؛ ئازاردان *( to ~ a blow or someone)* .

**infliction** (in-flik′shən), *n.* (١) بەلا بەسەردا هێنان؛ تووشی ناخۆشی کردن؛ سزا بەسەردادان
(٢) ئازار؛ سزا؛ ناخۆشی؛ بەلا؛ بەسەرهاتێنکی ناخۆش.

**influence** (in′floo-əns), *n.* (١) (أ) جۆرە شلەیەکی بێ ڕەنگە کە گوایە لە ئەستێرەکانەوە دێتەدەرەوەو کاردەکاتە سەر سرووشت و کردەوەی خەڵك.
(٢) (أ) کارتێکردن؛ دەسەڵات بەسەردا بوون
(ب) ئەنجامی ئەم کارتێکردنە
(٣) دەسەڵات؛ دەست؛ دەست ڕۆیشتن؛ ڕکێف؛ فەرمانڕەوایی.
(٤) کەسێکی بەدەسەڵات یا دەست ڕۆیشتوو؛ شتێکی بەدەسەڵات
*v.t.* کارتێکردن؛ کارکردنەسەر؛ دەسەڵات بەسەردابوون؛ کارتێکردن و گۆڕین کردەوە، کردار، ڕەووشت.

**influential** (in′floo-en′shəl), *adj.* بەدەسەڵات؛ کاریگەر؛ دەسەڵاتدار؛ دەست ڕۆیو؛ فەرمانڕەوا
*( an ~ person, politician, senator, etc.)*

**influenza** (in′floo-en′zə), *n.* ئنفلوەنزا؛ پەتا؛ درم. هەروەها پێنشی دەووترێ " flu " وە " grippe " )

**influx** (in′fluks′), *n.* (١) (أ) تێڕژان؛ ڕژانەناو
(ب) هاتنەژوورەوەی پەیتاپەیتا؛ هاتنی بەردەوام؛ تێرژان (مەجاز):
*( an ~ of customers in the shop)*
(٢) ڕێرگە؛ ناوڕێژ

**inform** (in-fôrm′), *v.t.* (١) (أ) شێوەپێگرتن؛ شێوەپێدان.
(ب) مرواندن. (٢) [Rare]. فێرکردن؛ کارکردنەسەر مێشك.
(٣) ئاگادارکردن؛ پێ ووتن؛ پێ ڕاگەیاندن (دەنگوباس).
*v.i.* خەبەرلێدان؛ بۆ تێ چاندن؛ لێ نووسین.

**informal** (in-fôr′m′l), *adj.* (١) نارەسمی:
*( an ~ truce, visit, etc.)*
(٢) سەرپێیی (جل وبەرگ)؛ بێ کەش وفش *( ~ clothes)*
(٣) سادە؛ خاکی. *( an ~ party, occasion, etc.)* .
(٤) تایبەتی بە زمانی دەمەتەقێ: *( ~ language)* .

**informality** (in′fôr-mal′ə-ti), *n.* (١) نارەسمیێتی؛ سەرپێیەتی؛ خاکێتی؛ بێ کەش وفشی. (٢) کردەوە یا کارێکی سەرپێیی

**informant** (in-fôr′mənt), *n.* (١) سیخوڕ؛ جاسووس
(٢) کەسێکە کە دەربارەی زمانی زگماکی خۆی دەنگوباس دەدات بە زمانناسی بێگانە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەکە؛ زانیاری پێدەر.

**information** (in′fẽr-mā′shən), *n.* (١) ڕاگەیاندن؛ پێ ووتن؛ پێ ووتران. (٢) دەنگوباس؛ هەواڵ؛ ئاگاداری. (٣) زانیاری.
(٤) پرسگە؛ فەرمانگەی دەنگوباس ڕاگەیاندن؛ مرۆڤی دەنگوباس ڕاگەیێنر
(٥) تاوانبارکردن (دادگا).
-informational *(adj.)*.

**information center,** پرسگە؛ مەڵبەندی دەنگوباس؛ مەڵبەندی ڕاگەیاندن

**informative** (in-fôr′mə-tiv), *adj.* ڕۆشنکەر؛ ڕوونکەرەوە
*( an ~ lecture)*

**informed** (in-fôrmd′), *adj.* ئاگادار؛ زانا؛ تێگەیشتوو؛ شارەزا؛ بەئاگا؛ بزان

**informer** (in-fôr′mẽr), *n.* سیخوڕ؛ جاسووس (بەتایبەتی یەکێك کە جاسووسی بەسەر ئەوانەوە دەکات کە دەیان ناسێ و بە برادەری خۆی دەزانێ)؛ خەبەرلێدەر

**infra-** (in′frə), پێشگرێکە بەمانای ئەژێر؛ ژێر: *( infrared)* .

**infract** (in-frakt′), *v.t.* پەیمان شکاندن؛ شکاندن (یاسا، پەیڕەو، پەیمان).

**infraction** (in-frak′shən), *n.* پەیمان شکاندن؛ شکان (یاسا، پەیڕەو)؛ سووچ؛ تاوان

**infrared** (in′frə-red′), *adj.* ـی تیشکی ژێر سوور

**infrequent** (in-frē′kwənt), *adj.* (١) دەگمەن؛ بە دەگمەن؛ کەم ڕوودەدات. (٢) ناڕێك وپێك؛ کەم کەم و ناڕێك وپێك: *( an ~ guest)*
-infrequence *(n.)*; infrequency *(n.)*; infrequently *(adv.)*.

**infringe** (in-frinj′), *v.t.* شکاندن (پەیمان، یاسا، پەیڕەو)؛ دەستدرێژی کردنەسەر؛ پەرژین شکاندن

infringe on ( or **upon** ), دەستدرێژی کردنەسەر مافی خەڵك؛ پەرژین شکاندن *( to infringe on other people's rights)*

**infringement** (in-frinj′mənt), *n.* (١) شکاندن (پەیمان، یاسا، پەیڕەو). (٢) دەستدرێژی بۆ سەر مافی خەڵك؛ پەرژین شکاندن

**infuriate** (in-fyoor′i-āt), *v.t.* زۆر تووڕەکردن.

**infuse** (in-fūz′), *v.t.* (١) تێکردن (شلە)؛ کردنەناو (شلە)؛ کردن بەسەردا. (٢) پڕکردن لە؛ تێکردن؛ پێدان:
*( to ~ fresh courage into soldiers; to ~ soldiers with fresh courage)*
(٣) تێهەڵکێشان؛ لێ هەڵکێشان؛ خستنەناو؛ تێدا نوقم کردن
*( tea-leaves are ~d in hot water.)*

**infusion** (in-fū′zhən), *n.* (١) تێکردن (شلە)؛ تێکران.
(٢) شتێکی تێکەڵاوکراو
(٣) خۆشاوی دوای شت کردنە ناو یا لە ئاودا نوقم کردن (چا
(٤) تێکەڵ کردن *( the ~ of new blood into old stock)*

**-ing** (iŋ), پاشگرێکە بەمانای (١) بۆ پێکهێنانی باری ئێستای بەردەوامی کردار: *( reading, going, singing, writing, drawing, etc.)*
(٢) دەخرێتەسەر کردار بۆ مانا بەخشینی: (أ) کردنی کارێك *( talking)*
(ب) ئەنجامی کارێك *( painting)* .

(ج) کەرەسەی کارێك: *(carpeting)*

**ingenious** (in-jēn′yəs), *adj.* (١) بلیمەت؛ دانا؛ زیرەك؛ کارامە؛ لێهاتوو؛ زانا: *(an ~ mechanic, actor, diplomat, writer, etc.)*.
(٢) بلیمەتانە کراوە؛ دانایانە دروستکراوە؛ کارامانە پێکهێنراوە؛ ڕەسەن:
*(an ~ machine, theory, explanation, etc.)*

**ingénue** (an′zhi-nōō′), *n.* (١) کچێکی ساویلکەی دڵپاك.
(٢) (ا) دەوری کچێکی ساویلکە لە شانۆنامەیەکدا.
(ب) ژنە ئەکتەرێك کە دەوری کچێکی ساویلکە دەبینێ لەسەر شانۆ.

**ingenuity** (in′jə-nōō′ə-ti, in′jə-nū′ə-ti), *n.* بلیمەتی؛ دانایی؛ زانایی؛ کارامەیی؛ ڕەسەنی:
*(His ~ was apparent to everyone.; the ~ of the plan)*

**ingenuous** (in-jen′ū-əs), *adj.* (١) خانەدان؛ جوامێر؛ سرووشتو ڕەفتار بەرز (٢) لەڕوو؛ بێ پێچوپەنا؛ کراوە.
(٣) سادە؛ خاکی؛ ساویلکە: *(an ~ smile)*.

**ingest** (in-jest′), *v.t.* خواردن (خواردەمەنی. دەرمان)؛ خواردەمەنی خواردن.

**-ingestion** *(n.)*.

**ingesta** (in-jes′tə), *n.pl.* خواردەمەنی؛ خۆراك؛ خواردن.

**inglenook** (iŋ′g'l-nook′), *n.* قوژبنی گوێ ئاگردان.

**inglorious** (in-glôr′i-əs, in-glō′ri-əs), *adj.* (١) شوورەیی؛ شەرمەزارکەر؛ حەیابەر؛ ناشرین (کردەوە)؛ سەرشۆڕکەر:
*(an ~ retreat, defeat, etc.)*
(٢) نەناسراو؛ بێ ناو؛ بێ ناوبانگ: *(to live an ~ life)*.

**-ingloriously** *(adv.)*.

**ingoing** (in′gō′iŋ), *adj.* (١) چووەناو؛ چووەژوورەوە؛ پیاچوو.
(٢) وورد؛ هەمووگرەوە.

**ingot** (iŋ′gət), *n.* (١) دارێژگە؛ قاڵب (٢) دارشتە؛ دارێژە.

**ingrain** (in-grān′), *v.t.* (١) لە خوم دان لەپێش چنیندا.
(٢) تێدا چەسپاندن؛ تێدا ناشتن؛ تێکەڵاوکردن؛ لە مێشکدا چەسپاندن.
*adj.* (١) لە خوم دراو لە پێش چنیندا. (٢) لە بەن یا دەزووی لە خوم دراو لە پێش چنیندا دروستکراوە (بەڕە، ژێرەخەر).
*n.* بەن و دەزووی لە خوم دراو پێش چنین.

**ingrained** (in-grānd′), *adj.* لە مێشکدا چەسپیو؛ ڕەگ داکوتاو:
*(~ habits, prejudices, principles, etc.)*

**ingrate** (in′grāt), *adj.* [Obs.], بەدنمەك؛ سپڵە؛ نمەك کوێر
*n.* کەسێکی سپڵە، بەدنمەك، نمەك کوێر، یا بێ سفەت.

**ingratiate** (in-grā′shi-āt′), *v.t.* خۆ لێ بردنە پێشەوە؛ مەرایی کردن؛ خۆ لێ نزیك کردنەوە؛ خۆ لەلا شیرین کردن:
*(He ~d himself with his boss.)*

**-ingratiation** *(n.)*.

**ingratitude** (in-grat′ə-tōōd′, in-grat′ə-tūd′), *n.* سپڵەیی؛ بەدنمەکی؛ نمەك کوێری.

**ingredient** (in-grē′di-ənt), *n.* (١) بەشی لێ پێکهاتوو (بەتایبەتی خواردەمەنی)؛ کەرەسە؛ دانە: *(the ~s of pea soup)*.
(٢) پێکهێن؛ پێکهێنەر؛ بەشی پێکهێنەر؛ کەرەسە (مەجان):
*(the ~s of success)*

**ingress** (in′gres), *n.* (١) چوونەژوورەوە؛ هاتنەژوورەوە.
(٢) مافی چوونەژوورەوە؛ ڕێ پێدانی چوونەژوورەوە.
(٣) دەرگا؛ کون؛ دەرك

**ingression** *(n.)*.

**ingrown** (in′grōn′), *adj.* (١) بۆ ناوەوە ڕوواو؛ لەناو گۆشتا ڕوواو (نینۆك)؛ بەناو گۆشتا چوو: *(an ~ toe nail)*.
(٢) زگماکی

**ingrowth** (in′grōth′), *n.* (١) بۆ ناوەوە ڕووان
(٢) شتێکی لەناو گۆشتا یا بۆ ناوەوە ڕوواو (نینۆك).

**ingulf** (in-gulf′), *v.t.* = **engulf.**

**ingurgitate** (in-gūr′jə-tāt′), *v.t.* هەڵ لووشین؛ بەپەلەو چڵێسانە خواردن.

**inhabit** (in-hab′it), *v.t.* تێدا ژیان (ماڵ، ناوچە)؛ تێدا نیشتەجێ بوون یا دانیشتن: *(to ~ a house, a region, country)*.

**-inhabitation** *(n.)*.

**inhabitable** (in-hab′i-tə-b'l), *adj.* بۆ تێدا ژیان دەشێت یا باشە؛ بەکاری تێدا ژیان دێت (خانوو، ناوچە).

**-inhabitability** *(n.)*.

**inhabitancy** (in-hab′i-tən-si), *n.* (١) تیا ژیان؛ تیا نیشتەجێ بوون؛ نیشتەجێیی. (٢) نیشتەجێ؛ ماڵ؛ خانە؛ لانە.

**inhabitant** (in-hab′i-tənt), *n.* دانیشتوو؛ نیشتەجێ؛ نیشتەنی:
*(the ~s of a town, region, country, etc.)*

**inhabited** (in-hab′i-tid), *adj.* ئاوەدان؛ ئاوا؛ ئاواکراوە؛ خەڵکی تێدا دەژی: *(an ~ house, place, town, etc.)*.

**inhalant** (in-hāl′ənt), *n.* دەرمانێکە کە بە هەناسە هەڵ بکێشرێ.
*adj.* بە هەناسە هەڵکێشان وەردەگیرێ.

**inhalation** (in′hə-lā′shən), *n.* (١) هەناسە هەڵکێشان؛ هەناسە وەرگرتن؛ قووتدان (دووکەڵ). (٢) دەرمانی بە هەناسە هەڵکێشراو.

**inhale** (in-hāl′), *v.t.* هەناسە هەڵکێشان؛ هەناسە وەرگرتن؛ قووتدان (دووکەڵ).
*v.i.* دووکەڵی جگەرە قووتدان.
*(He smokes; but doesn't ~ )*

**inhaler** (in-hāl′ēr), *n.* (١) هەناسەهەڵکێش؛ هەناسەدەر؛ دووکەڵی جگەرە قووتدەر. (٢) ئامێری پاککردنەوەی هەوا لە تۆزو دووکەڵو پیسی.
(٣) ئامێری هەناسەپێدەر.

**inharmonious** (in′här-mō′ni-əs), *adj.* (١) ناساز (دەنگ، مۆسیقا)؛ نەساز. (٢) ناکۆك؛ پێکەوە نەگونجاو؛ لەگەڵ یەك ڕێك نەکەوتوو.

**inhere** (in-hêr′), *v.i.* پارچەیەك بوون لە؛ بەشێکی جیانەبووەوە لە؛ پێوە نووساون؛ بەشێکی زگماکی یا خۆیی بوون لە.

**-inherence** *(n.)*; **inherency** *(n.)*.

**inherent** (in-hêr′ənt), *adj.* زگماکی؛ خۆیی؛ بەشێکی سرووشتییە لە؛ هەر لە خۆوە تیایەتی:
*(Weight is an ~ property of matter.; He has an ~ love of beauty.; Most people have an ~ fear of darkness.)*

**inherently** (in-hêr′ənt′li), *adv.* لە خۆیدا؛ بە زگماکی؛ لە بنچینەدا: *(Is man ~ good or bad?)*.

**inherit** (in-her′it), *v.t.* (١) میرات بردن؛ میرات وەرگرتن؛ میرات بۆ بەجێمان یا بەرکەوتن. (٢) بۆ بەجێمان لە باووباپیرەوە (سرووشتی خۆیی)؛ بۆ مانەوە: *(He ~ed his stubbornness from his mother.)*.

**inheritable** (in-her′i-tə-b'l), *adj.* (١) مافی میرات وەرگرتنی هەیە.
(٢) دەبێ بە میراتی؛ بۆی هەیە بەجێهێڵرێ و ببرێ بە میراتی.

**-inheritability** *(n.)*.

**inheritance** (in-her′i-təns), *n.* (١) میرات بردن؛ میرات وەرگرتن.
(٢) میراتی؛ میرات. (٣) کەلەپوور؛ شتی بۆ بەجێماو لە باووباپیرەوە.

**inheritor** (in-her′i-tēr), *n.* میراتبەر؛ میراتگر؛ بەشبەر.

**inhibit** (in-hib′it), *v.t.* (١) قەدەغەکردن.
(٢) ڕێ لێگرتن؛ پێشێل کردن؛ بەربەستکردن؛ ڕاگرتن؛ جڵەوگرتن؛ ڕێ بە خۆ نەدان و شەرم کردن:
*(to ~ wrong desires; Having been laughed at because of his lameness, the child became shy and ~ed.)*

**-inhibiter** *(n.)*; **inhibitive** *(adj.)*.

**inhibition** (in′hi-bish′ən, in′i-bish′ən), *n.* (١) ڕێ گرتن؛ ڕێ لە خۆ گرتن؛ ڕێ بە خۆ نەدان؛ جڵەوگیری؛ شەرم:
*(Wine weakens a person's ~s.; a man without ~s)*

(٢) كۆسپی مێشكیو هەستی؛ ڕێ لێگری دەروونی.

**inhospitable** (in-hos′pi-tə-b'l), *adj.* (١) ناخانەدان؛ میوان ڕەنەگر (٢) لانەنەدەر؛ چۆڵ؛ چۆڵەوانیو سەختو ناخۆش:
*( an ~ shore, region, place, etc.)*
-**inhospitableness** *(n.)*; **inhospitably** *(adv.)*;
**inhospitality** *(n.)*.

**inhuman** (in-hū′mən), *adj.* (١) نامرۆڤانە
(٢) درندەیی؛ بێ بەزەیی؛ بێ ڕەحم؛ دڵڕەق؛ دڵ بە كەس نەسووتاو.

**inhumane** (in′hyoo-mān′), *adj.* بێ بەزەیی؛ دڵ پێ نەسووتاو؛ بێ ڕەحم؛ دڵڕەق.

**inhumanity** (in′hyoo-man′ə-ti), *n.* (١) نامرۆڤایەتی؛ دڵڕەقی؛ درندەییتی؛ بێ بەزەییتی؛ دڵ بە كەس نەسووتان. (٢) كارێك یا ووتەیەكی نامرۆڤانەو دڵڕەقانە.

**inhume** (in-hūm′), *v.t.* ناشتن (مردوو)

**inimical** (in-im′i-k'l), *adj.* (١) ناحەز؛ دوژمنانە.
(٢) زیانبەخش: *( habits ~ to good health; acts ~ to peace)*.

**inimitable** (in-im′i-tə-b'l), *adj.* بێ هاوتا؛ بێ وێنە؛ لاسایی ناكرێتەوە.

**iniquitous** (in-ik′wə-təs), *adj.* ناڕەوا؛ زۆردار؛ ناهەق؛ ناپەسەند؛ بەد پیس ڕەفتار؛ ڕەووشت نزم

**iniquity** (in-ik′wə-ti), *n.* (١) ناڕەوایی؛ ناهەقی؛ زۆرداری؛ ڕەووشت نزمی؛ ڕەفتار پیسی؛ سەرسەرێتی
(٢) كردەوە یا كارێكی ناڕەوا، نزم، پیس، یا زۆردارانە.

**initial** (i-nish′əl), *adj.* (١) سەرەتا؛ سەرەتایی:
*( the ~ stage of a disease)*
(٢) تایبەتی بە تیپی یەكەمی ووشەیەك یا ناوێك.
*n.* تیپی یەكەمی ووشەیەك، بەتایبەتی: (١) تیپی گەورە لە سەرەتای بەندێكدا.
(٢) تیپی یەكەمی ناوی كەسێك یا شوێنێك: *( a person's ~s)*.
*v.t.* مۆركردن یا ئیمزاكردن بە تیپی یەكەمی ناوی خۆ:
*( to ~ a document)*

**initially** (i-nish′əl-i), *adj.* لە سەرەتادا؛ لەپێشەوە؛ یەكەم جار.

**initiate** (i-nish′i-āt′), *v.t.* (١) دەستپێكردن؛ دەستپێشكەری كردن:
*( to ~ reforms, a fight, a friendship)*
(٢) فێركردن؛ پێناسین؛ ڕاهێنان.
(٣) وەرگرتن یا كردن بە ئەندامی كۆمەڵەیەك.
*adj.* (١) دەستپێكراو. (٢) فێركراو؛ ڕاهێنراو.
(٣) تازە وەرگیراو بە ئەندامی كۆمەڵەیەك
*n.* ئەندامێكی تازە وەرگیراو لە كۆمەڵەیەكدا.
-**initiator** *(n.)*.

**initiation** (i-nish′i-ā′shən), *n.* (١) دەستپێكردن.
(٢) ڕاهێنان؛ فێركردن؛ ڕاهاتن. (٣) وەرگرتن بە ئەندام لە كۆمەڵەیەكدا؛ ئاهەنگو خوو نەریتی ئەندامی تازە وەرگرتن لە كۆمەڵەیەكدا.

**initiative** (i-nish′i-ə-tiv, i-nish′i-ā′tiv), *adj.* سەرەتایی.
*n.* (١) (ا) دەستپێشكەری: *( to take the ~ )*.
(ب) كردەوەیەكی دەست پێشكەری؛ هەنگاوێكی دەست پێشكەری:
*( a new European ~ about world peace)*
(٢) گیانی دەستپێشكەری كردن؛ گیانی هەنگاوی تازەو ئازا نان.
(٣) (ا) مافی پەرلەمان بۆ پێشكەشكردنی یاسای تازە.
(ب) مافی هاوولاتیان بۆ گۆڕینی یاسایەك یا دانانی یاسایەكی تازە لەڕێی كۆكردنەوەی ئیمزای دەنگدەرانەوە.
**on one's own initiative,** لەخۆوە؛ بەبێ كەس پێ ووتن یا زۆرلێكردن یا هاندان: *( He started the project on his own initiative.)*.
**take the initiative,** دەستپێشكەری كردن.

**initiatory** (i-nish′i-ə-tôr′i, i-nish′i-ə-tō′ri), *adj.* (١) سەرەتایی (٢) تایبەتی بە ئاهەنگو نەریتی ئەندامی تازە وەرگرتن لە كۆمەڵەیەكدا: *( ~ cermonies or rites)*.

**inject** (in-jekt′), *v.t.* (١) دەرزی لێدان؛ شرینقەلێدان.
(٢) تێكردن؛ تێخستن؛ پیاكردن.
(٣) تێ فڕێدان (ووتە، سەرنج، تێبینی)؛ تێكەڵاوكردن؛ تێخستن
*( to ~ plitics in the discussion)*

**injection** (in-jek′shən), *n.* (١) دەرزی لێدان؛ شرینقەلێدان.
(٢) خستنەناو؛ تێكردن؛ تێكران.
(٣) (ا) شرینقە؛ دەرزی: *( to give a patient an ~ )*.
(ب) دەرمانی بە شرینقە لێدراو.

**injudicious** (in′jōō-dish′əs), *adj.* نابەجێ؛ نائیرانە.

**injunction** (in-juŋk′shən), *n.* (١) فەرمان؛ پێ ووتن.
(٢) فەرمانی دادگا.

**injure** (in′jẽr), *v.t.* (١) بریندارکردن؛ زامارکردن؛ ئازاردان؛ زیان لێدان.
(٢) هەست بریندارکردن؛ كارێكی ناڕەوا كردن بەرامبەر؛ هەست ئازاردان:
*( You ~d my feeling.)*

**injurious** (in-joor′i-əs), *adj.* (١) زیانبەخش؛ بە زیان.
(٢) بریندارکەر (هەست)؛ لكەداركەر؛ ڕیسواكەر؛ ناشرین؛ سووك.

**injury** (in′jẽr-i), *n.* (١) برین؛ زام؛ زیان؛ ئازار.
(٢) ستەمكاری؛ هەست بریندارکردن؛ ماف پێشێل كردن؛ دەستدرێژی
(٣) كارێكی ناڕەوا یا ستەم.

**injustice** (in-jus′tis), *n.* (١) ناڕەوایی؛ زۆرداری؛ زوڵم؛ زوڵمو زۆر؛ ناهەقی؛ غەدر؛ بێ دادی. (٢) كارێكی ناڕەوا یا ناهەق؛ كردەوەیەكی زاڵمانە.

**ink** (iŋk), *n.* مەرەكەب.
*v.t.* (١) لە مەرەكەب هەڵكێشان (مۆر)؛ مەرەكەب كردن بەسەردا.
(٢) بە مەرەكەب نیشانەكردن.

**inkhorn** (iŋk′hôrn′), *n.* مەرەكەبدان (هی كەڵەشاخ).

**inkling** (iŋk′liŋ), *n.* (١) نیشانە؛ نیشانەیەكی ناڕاستەوخۆ.
(٢) ئاگا؛ دڵ خەبەردان؛ هەست؛ هەستپێكردن:
*( I had no ~ of what was happening.)*

**inkstand** (iŋk′stand′), *n.* (١) مەرەكەبدانو قەڵەمدانی سەر مێز.
(٢) مەرەكەبدانی سەر مێز؛ مەرەكەبدان؛ شووشە مەرەكەب.

**inkwell** (iŋk′wel′), *n.* مەرەكەبدانی سەر مێز؛ شووشە مەرەكەب.

**inlaid** (in′lād′, in-lād′), *adj.* بۆ جوانی خراوەتە ناو شتێكەوە یا تێیدا هەڵكەنراوە بەڵام ڕێكە لەگەڵ ڕووی شتەكەدا (نەقش‌ونیگار).

**inland** (in′lənd), *adj.* (١) تایبەتی بە بەشی ناوەوەی وولاتێك.
(٢) خۆوڵاتی؛ خۆماڵی
*n.* ناوەوەی وولاتێك؛ ناوچەی ناوەوەی وولات.
*adv.* بەرەو ناوەوەی وولاتێك؛ دوور لە سنووری وولاتەوە.

**inlander** (in′lən-dẽr), *n.* جێنشین یا دانیشتووی بەشی ناوەوەی وولاتێك.

**in-law** (in′lô′), *n.* خزمی ژن (خەسوو، خەزوور، ژن برا، ژن خوشك، براژن؛ زاوا،... هتد)؛ خزمی مێرد؛ خزمی ژنو مێرد.

**inlay** (in-lā′), *v.t.* (١) تێخستن یا هەڵكەندنی زێڕو بەردی بەنرخ یا نەقشو نیگار لەناو شتێكدا بە مەرجێك لەگەڵ ڕووی شتەكەدا ڕێك بێت.
(٢) ڕازاندنەوەی ڕووی شتێك بەم جۆرە.
*n.* (١) شتی ڕازێنەرەوەی لە ڕوویەكدا هەڵكەنراو یا تێخراو.
(٢) ددان پڕكەرەوە؛ ناوئاخنی ددانی پڕكراوە.

**inlet** (in-let′), *v.t.* خستنەناو؛ تیا قایم كردن یا چەسپاندن.
*n.* (١) (ا) جۆگە؛ ڕووبار. (ب) جۆگە یا كەنداوێك كە لە ڕووبار، دەریا، یا دەریاچەیەكەوە هاتبێ یا جیابووبێتەوە (ج) كەنداوێكی نێوان دوو دوورگە
(٢) دەرگا؛ كون؛ جێی چوونەژوورەوە.
(٣) شتێكی تێخراو، تێ چەسپێنراو، یا لێ هەڵكەنراو.

**inmate** (in′māt′), *n.* (١) هاوخانە؛ هاومال؛ نیشتەجێی خانوویەك
(٢) نیشتەجێی بەندیخانە، شێتخانە، یا پەناگا؛ بەند:
*( the prison ~s demanded better treatment.)*

**in memoriam** (in´ mə-môr′i-əm), [L.]. به یادی فلان کەسەوە. لەسەر کێلی مردوو لە بڵاونامەی ڕۆژنامەدا دەنووسرێ بە بۆنەی مردنی کەسێکەوە

**inmost** (in′mōst´, in′məst), *adj.* innermost.

**inn** (in), *n.* (١) خان؛ ئوتێل (٢) چێشتخانەو مەیخانە؛ مەیخانە (٣) خانەی قوتابیانی ئینگلتەرە.

**innards** (in′ẽrdz), *n.pl.* (١) هەناو؛ ڕیخۆڵە؛ ناوسک. (٢) ناوەڕۆک؛ ناوناخن؛ بەشی ناوەوەی شتێک.

**innate** (in′āt, i-nāt′), *adj.* زگماکی؛ خۆیی؛ لە خۆیدایە؛ لە خۆدایە؛ سرووشتی *( ~ courtesy; to have an ~ ability to sympathize with others)*

-innately *(adv.)*; innateness *(n.)*.

**inner** (in′ẽr), *adj.* (١) ناوەوە؛ هی ناوەوە؛ ژوورەوە؛ *( an ~ room, door, etc.)*

(٢) تایبەتی بە مێشک و دەروون؛ دەروونی؛ گیانی.

(٣) هی ناخ؛ قووڵ؛ تایبەتی بە خۆ؛ نهێنی؛ کەس پێ نەزان: *( ~ emotion)*.

*n.* ناوەوە؛ ناوەکی؛ ناوخۆ

**inner circle,** دەستەی دەسەڵاتداران یا نزیک لە فەرمانڕەوا؛ دەستەی کاربەدەست یا شت بەدەستی وڵاتێک یا دەزگایەک.

**inner city,** ناوەوەی شار (بەتایبەتی گەڕەکە هەژارو قەرەباڵغەکان)

**innermost** (in′ẽr-mōst´, in′ẽr-məst), *adj.* (١) هەرە ناوەوە؛ هی ناوی ناوەوە؛ هی ناوەوە. (٢) دەروونی؛ کانگا؛ ناخ؛ قووڵترین؛ کەس پێ نەزان و تایبەتی بە خۆ: *( One's ~ thoughts, feeling, and desires)*

**inning** (in′iŋ), *n.* کایە؛ یاری

**innkeeper** (in′kēp´ẽr), *n.* خانچی؛ ئوتێلچی.

**innocence** (in′ə-s′ns), *n.* (١) بێ تاوانی؛ بێ سووچی؛ بێ گوناهی (٢) داوێن پاکی؛ پاکی. (٣) بەسزمانی؛ ساوێلکەیی؛ دڵ سافی؛ بێ فڕوفێڵی؛ سادەیی (٤) مێشک سووکی؛ منداڵێتی؛ کەرێتی؛ بێ مێشکێتی؛ نەزانی (٥) کەسێکی ساوێلکە، داوێن پاک؛ بێ تاوان، یا بێ مێشک. (٦) جۆرە ڕووەکێکی گوڵ شین و سپییە.

**innocent** (in′ə-s′nt), *adj.* (١) داوێن پاک؛ پاک: *( as ~ as a child)*

(٢) بێ تاوان؛ بێ سووچ؛ بێ گوناه *( He was found ~ of all charges.)*

(٣) زیان نەبەخش؛ بێ زیان؛ بێ وەی: *( an ~ remark)*.

(٤) ساوێلکە؛ بەسزمان

(٥) نەزان؛ نەزان؛ سادە؛ نەشارەزا

(٦) بێ فڕوفێڵ؛ بێ مەبەست؛ سادە *( an ~ smile)*

*n.* (١) کەسێکی داوێن پاک (٢) کەسێکی ساوێلکەو سادەو هیچ نەزان. (٣) منداڵ

**innocuous** (i-nok′ū-əs), *adj.* بێ زیان؛ زیان نەبەخش؛ بێ وەی.

**innovate** (in′ə-vāt´), *v.i.* داهێنانی شتی تازە؛ تازەکردنەوە؛ شێوازو ڕێبازو ئامێری نوێ بەکارهێنان لە کارو لە ژیاندا

**innovation** (in´ə-vā′shən), *n.* (١) شتی تازە داهێنان؛ تازەکردنەوە؛ هەمیشە ڕێبازو ئامێری تازە بەکارهێنان؛ ڕێی تازە دۆزینەوە بۆ شت کردن (٢) شتێکی تازە داهێنراو؛ ڕێبازێکی تازە؛ ئامێرێکی تازە داهێنراو

**innovative** (in′ə-vā´tiv), *adj.* تازەکەرەوە (ڕێباز، ئامێر، شێوان)؛ داهێنەر؛ تازە؛ تازە دەستپێکراو: *( an ~ artist, teacher, person; an ~ method)*

**innovator** (in′ə-vā´tẽr), *n.* داهێنەری ڕێبازو شێوازو ئامێری تازە.

**innoxious** (i-nok′shəs, in-nok′shəs), *adj.* بێ زیان؛ بێ وەی؛ زیان نەبەخش

**innuendo** (in´ū-en′dō), *n.* پلار؛ لاپلار؛ توانج؛ تەقە (مەجاز)؛ قسەی بە توێکڵ؛ وتەی توێکڵدار.

**innumerable** (in-nū′mẽr-ə-b′l), *adj.* لە ژماردن نایەت؛ ناژمێرێ؛ بێ شومار؛ لە ژمارە نەهاتوو.

**innumerous** (i-nōō′mẽr-əs, in-nū′mẽr-əs), *adj.* = innumerable.

**innutritious** (in´nōō-trish′əs, in´ū-trish′əs), *adj.* نابژێنی؛ کەڵکی کەمە یا نییە بۆ تەندرووستی (خواردەمەنی).

**inobservance** (in´əb-zûr′vəns), *n.* (١) سەرنج نەدان؛ بێ سەرنجی؛ گوێ نەدان. (٢) پەیڕەوی نەکردن (یاسا، پەیمان، نەریت).

-inobservant *(adj.)*.

**inoculate** (in-ok′yoo-lāt´), *v.t.* (١) کوتان (پزیشکەوانی) (٢) خستنە مێشکەوە؛ مێشک پڕکردن لە.

**inoculation** (in-ok´yoo-lā′shən), *n.* (١) کوتان (پزیشکەوانی) (٢) دەرمانی کوتان.

**inoculum** (in-ok′yoo-ləm), *n.* دەرمانی کوتان.

**inodorous** (in-ō′dẽr-əs), *adj.* بێ بۆن.

**inoffensive** (in´ə-fen′siv), *adj.* بێ زیان؛ زیان نەبەخش؛ بێ وەی؛ ناپەسەند نییە؛ خراپ نییە؛ ناشرین نییە (ڕەووشت، کردەوە)

**inofficious** (in´ə-fish′əs), *adj.* (١) بێکار؛ کارنەکەر (٢) دژ بە سرووشت یا پەیڕەوی کردنی نەریت و پەیوەندی خێزانی – (بە وەسیەتنامەیەک دەوترێ کە ئەوانەی مافی میرات بردنیان هەیە هەموویان تێدا بێ بەش کرابن بەبێ پیشاندانی هیچ هۆیەک)

**inoperable** (in-op′ẽr-ə-b′l), *adj.* (١) ناخرێتە کار؛ کاری پێ ناکرێ (٢) بۆ نەشتەرکاری ناشێ: *( an ~ cancer)*

**inoperative** (in-op′ə-rā´tiv, in-op′ẽr-ə-tiv), *adj.* (١) کاری پێ ناکرێ (یاسا، پەیڕەو)؛ وەستێنراو (٢) ناکاریگەر؛ بێ ئەنجام؛ بێ کەڵک.

**inopportune** (in-op´ẽr-tōōn′, in´op-ẽr-tūn′), *adj.* کاتی خۆی نییە؛ ناوەخت؛ نابەجێ: *( an ~ time, visit, request, etc.)*

**inordinate** (in-ôr′d′n-it), *adj.* (١) نارێک وپێک؛ شێواو. (٢) (ا) لە ڕادە بەدەر؛ زیاد لە پێویست؛ نابەجێ: *( ~ demands)* (ب) جڵەونەگیراو؛ بەر بۆ بەرەڵاکراو؛ بەرەڵا؛ دابین نەکراو؛ بێ سنوور: *( ~ passions)*

-inordinately *(adv.)*.

**inorganic** (in´ôr-gan′ik), *adj.* (١) نازیندەبەر؛ نائۆرگانیک: *( Rocks and metals are ~ substances.)*

(٢) ناسرووشتی؛ دەستکرد.

(٣) تایبەتی بە کیمیای ئۆرگانیک.

-inorganically *(adv.)*.

**inorganization** (in-ôr´gən-i-zā′shən), *n.* نارێک وپێکی؛ شێواوی

**inosculate** (in-os′kyoo-lāt´), *v.i.* (١) (ا) بەیەکگەیشتنی سەرەکانیان (دەماری خوێن، بۆری)؛ لێکدان (ب) لەیەکەوەئاڵان؛ تەرز؛ ئاڵۆسکان. (٢) تێکەڵاوبوون؛ بوون بەیەک؛ یەکگرتن.

-inosculation *(n.)*.

**inpatient** (in′pā´shənt), *n.* نەخۆشی لە خەستەخانە کەوتوو.

**input** (in′poot´), *n.* (١) ووزە یا تەووژمی ئەلەکتریکی خراوەناو مەکینەیەکەوە؛ تێخراو. (٢) زانیاری خراوەناو کۆمپیوتەرەوە بۆ چارەسەر- کردنی. (٣) شتێکی پێشکەش کراو یا خراوە بەرچاو (پێشنیاز، ڕەخنە) *( The director is asking for our ~ concerning this matter.)*

**inquest** (in′kwest), *n.* (١) لێکۆڵینەوەیەکی دادگەری لە مردنێکی ناکاوی و ناسرووشتی (بەتایبەتی لە بەردەم دەستەی سوێندخوارانـدا). (٢) دەستەی لێکۆڵەرەوەی وەها. (٣) ئەنجام و بڕیاری لێکۆڵینەوەیەکی وەها (٤) لێکۆڵینەوە؛ ساغ کردنەوە.

**inquietude** (in-kwī′ə-tōōd´, in-kwī′ə-tūd´), *n.* بێ ئارامی؛ بێ سرەوتی؛ نەسرەوتن

**inquire** (in-kwīr′), *v.i.* (١) پرسین؛ پرسیارکردن.
(٢) (~ into)، لێکۆڵینەوە؛ ساغ کردنەوە؛ لێ ووردبوونەوە.
**inquire after,** لێ پرسینەوە لە تەندرووستی کەسێك.

**inquiry** (in-kwīr′i, in′kwə-ri), *n.* (١) پرسین؛ پرسیارکردن
(٢) لێکۆڵینەوە؛ ساغ کردنەوە؛ ووردبوونەوە. (٣) پرسیار؛ پرس.

**inquisition** (in′kwə-zish′ən), *n.* (١) لێکۆڵینەوە؛ ساغ کردنەوە؛
لێ ووردبوونەوە. (٢) **inquest**. (٣) [I-] (ا) بۆ گەڕان و سزادانی بێ بڕوایان
لەلایەن کڵێسەی کاسۆلیکەوە (ب) دادگای کڵێسە لە سەدەی سیانزەهەمدا بۆ
سزادانی کفرکردن و کافران (ج) نیش و کاری ئەم دادگایە.
(٤) لێکۆڵینەوە و سزادانی توندوتیژو هەوەسکاری کەسانی دژ بە ڕژێم.
-inquisitional *(adj.)*.

**inquisitive** (in-kwiz′ə-tiv), *adj.* (١) حەز بە شت زانین کەر؛
حەزکەر بە پرسیارکردن و فێربوون: ***(to have an ~ mind)***.
(٢) حەزکەر بە دۆزینەوەو زانینی دەنگوباس و شتی نهێنی زیاد لە پێویست:
***(She is very ~.)***
-inquisitively *(adv.)*; inquisitiveness *(n.)*.

**inquisitor** (in-kwiz′ə-tẽr), *n.* (١) لێکۆڵەرەوە.
(٢) [I-]، کاربەدەست یا دادپرسێکی دادگای کڵێسە (ژمارە سێی ووشەی
پێشوو ببینە).
-inquisitorial *(adj.)*.

**inroad** (in′rōd′), *n.* (١) پەلامار؛ هێرش؛ شاڵاو؛ بەردەباران.
(٢) کنە کنەلێکردن؛ دەستدرێژی؛ زیان؛ بنکەن:
***(These long hours will make ~s on your health.)***

**insalivate** (in-sal′ə-vāt′), *v.t.* خواردەمەنی و تف تێکەڵاوکردن
لەکاتی جویندا.

**insane** (in-sān′), *adj.* (١) شێت؛ مێشك تێکچوو.
(٢) تایبەتی بە شێتان؛ هی شێتان: ***(an ~ asylum)***.
(٣) شێتانە؛ بێ مێشکانە؛ بێ مێشك؛ نابەجێ؛ بێ مانا: ***(an ~ idea)***.
-insanely *(adv.)*.
**the insane,** شێتان؛ خەڵکی شێت

**insanitary** (in-san′ə-ter′i), *adj.* ناتەندرووستی؛ پیس و پۆخڵ؛
بۆ تەندرووستی خراپە: ***(~ conditions, houses, etc.)***.

**insanitation** (in-san′ə-tā′shən), *n.* پیس و پۆخڵی؛
ناپاك و تەمیزی؛ ناتەندرووستی

**insanity** (in-san′ə-ti), *n.* (١) شێتی؛ شێتێتی؛ مێشك تێکچوون
(٢) نابەجێیی؛ بێ مێشکی؛ کەرێتی؛ بێ مانایی

**insatiable** (in-sā′shə-b′l, in-sā′shi-ə-b′l), *adj.* تێرنەخۆر؛
هەرگیز تێر نابێ؛ تێربوونی بۆ نییە؛ چاوبرسی:
***(an ~ person; ~ desires)***
-insatiability *(n.)*; insatiably *(adv.)*.

**insatiate** (in-sā′shi-it), *adj.* = **insatiable.**

**inscribe** (in-skrīb′), *v.t.* (١) لەسەر هەڵکەندن (ناو، ووتە، نیشانە،
درووشم): ***(to ~ a name on a tombstone)***.
(٢) ناو خستنەسەر لیستەیەك؛ ناونووسین.
(٣) پێشکەش کردنی پەرتووکێك بۆ کەسێك (بە نووسینی چەند ووتەیەك
لەسەرەتای پەرتووکەکەدا). (٤) لە مێشکدا چەسپاندن.
(٥) دروستکردنی وێنەیەکی ئەندازەیی لەناو وێنەیەکی تردا بە مەرجێك لە
زۆرترین شوێندا کەمەرەکانیان لەیەکتر بدەن (ئەندازە).

**inscription** (in-skrip′shən), *n.* (١) ناو یا نیشانە لەسەر هەڵکەندن.
(٢) شتی لەسەر هەڵکەنراو (ناو، نیشانە، دروشم، ووتە)؛ شتی نووسراو؛
نووسین ***(The ~ on the monument, the coin, the medal, etc.)***.
(٣) پێشکەش کردنی پەرتووکێك بە یەکێك لە سەرەتای پەرتووکەکەدا.
-inscriptional *(adj.)*; inscriptive *(adj.)*.

**inscrutable** (in-skrōō′tə-b′l), *adj.* سەری لێ دەرناکرێ (مەسەلە،
نووسراو)؛ ناخوێنرێتەوە؛ کەس ناتوانێ تێی بگات (مەسەلە، باس، مرۆڤ،
شوێن)؛ لێڵ؛ هەست و نەستی نازانرێ؛ مەبەستی نازانرێ:
***(an ~ person, people, look, country, face, etc.)***
-inscrutability *(n.)*; inscrutableness *(n.)*.

**insect** (in′sekt), *n.* مێروو؛ جانەوەر؛ جرجانەوەر؛ مێش و مەگەز.

**insectarium** (in′sek-târ′i-əm), *n.* (١) مێرووخانە (بۆ
لێکۆڵینەوە)؛ جرجانەوەرخانە (٢) مێرووی پەروەردەکراو بۆ لێکۆڵینەوە

**insectary** (in′sek-ter′i), *n.* = **insectarium.**

**insecticide** (in-sek′tə-sīd′), *n.* مێرووکوژە؛ مێرووکوژ (دەرمان)؛
دەرمانی جانەوەرکوژ؛ دەرمانی مێش و مەگەز لەناوبردن.

**insectile** (in-sek′til), *adj.* (١) مێروویی؛ هی مێش و مەگەز؛
جانەوەری. (٢) لە مێروو یا جانەوەر پێکهاتوو.

**insectivore** (in-sek′tə-vôr′, in-sek′tə-vōr′), *n.* گیاندار یا
ڕووەکی مێرووخۆر.

**insectivorous** (in′sek-tiv′ẽr-əs), *adj.* مێرووخۆر؛ جانەوەرخۆر.

**insectology** (in′sek-tol′ə-ji), *n.* مێرووناسی؛ جانەوەرناسی؛
زانستی جرجانەوەر.

**insecure** (in′si-kyoor′), *adj.* (١) مەترسیدار؛ پڕ مەترسی؛
مەترسی لێکراو؛ بێ ئاسایش. (٢) بڕوا بە خۆ نەبوو؛ نائاسوودە؛ ترساو؛
بە ترس: ***(an ~ person, child, etc.)***
(٣) شلۆق؛ پشت پێ نەبەستراو؛ نەچەسپیو

**insecurity** (in′si-kyoor′ə-ti), *n.* (١) مەترسی
(٢) بڕوا بە خۆ نەبوون؛ ترس؛ ترسان.
(٣) شلۆقی؛ نەچەسپاوی؛ پشت پێ نەبەستران.

**inseminate** (in-sem′ə-nāt′), *v.t.* سکپڕکردن؛ لێ پەڕین؛ پیتاندن؛
تۆماو تێکردن؛ چاك کردن؛ لێ چاك کردن.
-insemination *(n.)*; inseminator *(n.)*.

**insensible** (in-sen′sə-b′l), *adj.* (١) بێ هەست؛ هەست مردوو؛
هەست بە هیچ نەکەر. (٢) بێ هۆش؛ لە هۆش خۆ چوو.
(٣) گوێ نەدەر؛ بێباك؛ بێ دەربەست؛ بێ ئاگا
(٤) ناشرین (کردەوە، ڕەووشت)؛ نابەجێ؛ بێ مانا؛ دڵی خەڵك ڕانەگر؛
بێ هەست؛ بێ هەستانە: ***(an ~ person, act; ~ behavior)***.
(٥) ئەوەندە کەمە هەستی پێ ناکرێ.
-insensibility *(n.)*; insensibly *(adv.)*.

**insensitive** (in-sen′sə-tiv), *adj.* (١) هەست پێ نەکەر؛
هەست نەکەر؛ هەست مردوو: ***(~ to beauty, touch, etc.)***.
(٢) بێ هەست (بەرامبەر بە خەڵك)؛ بێ دەربەست؛ گوێ نەدەر؛
کاری تێ ناکرێ: ***(~ to people's wishes)***.
-insensitivity *(n.)*; insensitiveness *(n.)*.

**insentient** (in-sen′shi-ənt, in-sen′shənt), *adj.* بێ گیان؛
بێ هۆش؛ بێ ژین.

**inseparable** (in-sep′ẽr-ə-b′l), *adj.* لە یەکتر جیا نابنەوە؛
لە یەکتری جیا ناکرێنەوە؛ هەمیشە پێکەوەن: ***(~ friends)***
*n.pl.* کەسانی هەمیشە بەیەکەوەو لەیەك جیانەبووەوە

**insert** (in-sûrt′), *v.t.* (١) تێخستن؛ خستنەناو؛ خستنە نێوانەوە.
***(to ~ a key in a hole or an advertisment in a newspaper)***
(٢) خستنەسەر؛ خستنەناو؛ دانەدەم:
***(to ~ a sentence in a paragraph)***
*n.* شتی تێخراو (بەتایبەتی پەڕەیەکی زیادە لەناو ڕۆژنامە یا پەرتووکێکدا).

**insertion** (in-sûr′shən), *n.* (١) تێخستن؛ خستنەناو؛ خستنەسەر.
(٢) شتێکی تێخراو (ڕستەی زیادە لەناو بەندا، بڵاونامە لە ڕۆژنامەدا... هتد).
(٣) شێوەو جێی لێکدانی ماسولکە یا ئەندامی لەش.
(٤) تیرە، تیلماسك، یا نەقشێك کە دەدرێتە دەم جل و بەرگ.

**inset** (in-set′), *v.t.* خستنەناو؛ تێخستن.
*n.* شتێکی تێخراو یا خراوەسەر (بەتایبەتی وێنە یا نەخشەیەکی بچووك کە
دەخرێتەسەر یا ناو وێنە یا نەخشەیەکی گەورەتر).

**inshore** (in′shôr′, in′shōr′), *adv. & adj.* (١) بەرەو قەراغی دەریا (٢) نزیك قەراغی دەریا؛ لە نزیك قەراغی دەریا دەكرێت

**inside** (in′sīd′, in′sīd′), *n.* (١) ناوەوە؛ ناو؛ ژوورەوە؛ لە ناوەوە؛ ناوەكەی (٢) دیوی ناوەوە. (٣) ناوەڕاست. (٤) دەروون؛ هەست و نەست.
(٥) (*pl.*) [Colloq.]، ناوسك؛ ڕیخۆڵە؛ هەناو.
(٦) [Slang]، دەنگوباسی نهێنی.

*adj.* (١) ناوەكی؛ ناوەوە؛ هی ناوەوە. (٢) بۆ ناوەوە گونجاو یا باش.
(٣) لەناوماڵدا بەكارهێنراو؛ هی ناوماڵ.
(٤) نهێنی؛ تەنها كەسانی نزیك دەیزانن:
*( ~ information; the ~ story)*

*adv.* (١) لە ناوەوە؛ ناوەكی (٢) لەناوماڵدا.

*prep.* (١) لە ماوەی؛ بە كەمتر لە (كات). (٢) بۆناو؛ بەرەو.

**inside of,** [Colloq.], بە كەمتر لە (كات)؛ لە ماوەی
*( inside of a week)*

**inside out,** (١) ناوەژوو؛ بە هەڵگەڕاوەیی
(٢) بە وردی؛ زۆرباش؛ هەمووی: *( to know something inside out)*.

**on the inside,** نزیك لەوانەوە كە شتیان بە دەستە

**insider** (in′sīd′ēr), *n.* (١) ئەندامی بەدەسەڵاتی دەستە یا كۆمەڵەیەك
(٢) كەسێكی نزیك بەوانەی شتیان بە دەستە؛ كەسێكی بە ئاگاو بەدەسەڵات لە كۆمەڵە، حیزب، یا فەرمانڕەواییدا؛ كەسێكی خۆیی.

**inside track,** (١) دیوی ناوەوەی مەیدانی پێشبڕكێ، واتە دیوە كورتترەكە (٢) بارێكی باش، زاڵ، یا خاترگیراو لە ملەملێیەكدا:
*( One candidate for the job had the ~ . )*

**insidious** (in-sid′i-əs), *adj.* (١) پیس كردەوە؛ مزۆق؛ فێڵباز؛ نهێنكر (مەجاز)؛ ناپاك *( an ~ enemy, remark, etc.)*
(٢) هەستی پێ ناكرێ هەتا وردە وردە تەشەنە دەكات؛ نهێنگر (مەجاز):
*( an ~ disease)*

-**insidiously** *(adv.)*; **insidiousness** *(n.)*.

**insight** (in′sīt′), *n.* (١) ڕێ بەدیی؛ تیژبینی؛ سەرنج تیژی؛ توانای باش بینین و تێگەیشتن
*( a man of ~ ; ~ into human character)*
(٢) تێگەیشتن لە ئەنجام یا بە بەكارهێنانی ڕێ بەدیی:
*( to gain an ~ into a person's mind)*

**insignia** (in-sig′ni-ə), *n.pl.* دروشم، كۆمەڵە، ئەندامێتی، پلەوپایەی كاربەدەستی وەك ئەفسەر و پۆلیس؛ نیشان

**insignificance** (in′sig-nif′ə-kəns), *n.* ناگرنگی؛ بێ بایەخی؛ هیچ و پووچی؛ بێ نرخی

**insignificancy** (in′sig-nif′ə-kən-si), *n.* (١) ناگرنگی؛ هیچ و پووچی؛ بێ بایەخی؛ بێ نرخی. (٢) كەسێك یا شتێكی هیچ و پووچ.

**insignificant** (in′sig-nif′ə-kənt), *adj.* (١) هیچ و پووچ؛ ناگرنگ؛ بێ نرخ؛ بێ بایەخ. (٢) بچووك؛ كەم (٣) بێ مانا

**insincere** (in′sin-sêr′), *adj.* ناپاك؛ نادڵسۆز؛ دووڕوو؛ پشت بێ نەبەستراو

**insincerity** (in′sin-ser′ə-ti), *n.* ناپاكی؛ نادڵسۆزی؛ دووڕوویی؛ پشت پێ نەبەستران.

**insinuate** (in-sin′ū-āt), *v.t.* (١) بە خشپە و دانایانە خۆبردنە-پێشەوە و چوونەناو. (٢) بە لاتیل پێ وتن؛ را گەیاندن؛ لاپلار تێگرتن؛ دەربڕین بە ناڕاستەوخۆ: *( He ~d his doubt of her ability.)*.

**insinuating** (in-sin′ū-ā′tiŋ), *adj.* (١) گومان پەیداكەر؛ لاپلار؛ ناڕاستەوخۆ و ناحەز (وتە) *( ~ remarks)*
(٢) خۆ لا شیرینكەر؛ پڕ لە مەرایی و خۆبردنەپێشەوە *( a silky ~ voice)*.

**insinuation** (in-sin′ū-ā′shən), *n.* (١) توانج هاویشتن؛ لاپلار تێگرتن؛ بە لاتیل پێ وتن. (٢) توانج؛ لاپلار؛ قسەی بە توێكڵ.
(٣) مەرایی؛ كردەوە یا وتەی خۆ لێ بردنەپێشەوە

**insipid** (in-sip′id), *adj.* (١) بێ تام؛ ناخۆش: *( ~ food)*.
(٢) (أ) وشك (دەمەتەقێ، چیرۆك)؛ بێ تام (مەجاز):
*( ~ conversation; an ~ story)*
(ب) وشك و بێ مێشك و هەست مردوو: *( pretty but ~ young lady)*.

-insipidity *(n.)*.

**insipience** (in-sip′i-əns), *n.* كەرێتی؛ بێ مێشكی.

**insipient** (in-sip′i-ənt), *adj.* كەر؛ بێ مێشك.

**insist** (in-sist′), *v.i. & v.t.* سووربوون لەسەر؛ پێ لێ داگرتن؛ بە زۆر داواكردن؛ ووڕك گرتن:
*( He ~s on the rights of minorities.; I ~ that you come.; Don't agree unless he ~s.)*

**insistence** (in-sis′təns), *n.* سوور بوون لەسەر؛ پێ لێ داگرتن؛ زۆرلێكردن؛ بە زۆر داواكردن؛ ووڕك گرتن.

**insistent** (in-sis′tənt), *adj.* (١) سوور لەسەر؛ ووڕككر؛ كۆڵنەدەر لە داواكردن. (٢) سەرنج ڕاكێش.

**insofar** (in′sō-fär′, in-sə-fär′), *adv.* ئەوەندەی كە؛ بەو ڕادەیەی كە: *( Insofar as I can say now, I shall come.)*

**insolate** (in′sō-lāt′), *v.t.* لەبەر هەتاو هەڵخستن.

**insolation** (in′sō-lā′shən), *n.* (١) لەبەر هەتاو هەڵخستن.
(٢) چارەكردنی نەخۆشی بە تیشكی خۆر.
(٣) گەرمابردن؛ خۆرانگاز؛ هەتاوگاز.
(٤) (أ) تیشكی ڕۆژی كەوتەسەر زەوی.
(ب) ڕادەی ئەم تیشكە.

**insolence** (in′sə-ləns), *n.* (١) لووت بەرزی؛ لەخۆبایی بوون؛ فیز؛ ترزل؛ كەش وفش. (٢) بێ حەیایی؛ بێ شەرمی؛ چاوقایمی.
(٣) كردەوەیەكی لووت بەرزانە یا بێ حەیایانە.

**insolent** (in′sə-lənt), *adj.* (١) لەخۆبایی؛ لووت بەرز؛ بەفیز؛ ترزل.
(٢) بێ حەیا؛ بێ شەرم؛ چاوقایم.

**insoluble** (in-sol′yoo-b'l), *adj.* (١) بێ چارە؛ چارەسەری نییە؛ چارەسەر ناكرێ. (٢) ناتوێتەوە.

-insolubility *(n.)*.

**insolvable** (in-sol′və-b'l), *adj.* بێ چارە؛ چارەسەری نییە؛ چارە ناكرێ.

**insolvency** (in-sol′vən-si), *n.* نابووتی؛ مایەپووتی؛ قەرز بۆ نەدرانەوە.

**insolvent** (in-sol′vənt), *adj.* (١) نابووت؛ مایەپووت.
(٢) بەشی قەرزدانەوە ناكات (میرات).
(٣) تایبەتی بە مایەپووتی یا مایەپووتان.

*n.* كەسێكی مایەپووت.

**insomnia** (in-som′ni-ə), *n.* خەوزڕان؛ خەو لێ نەكەوتن.

-insomnious *(adj.)*.

**insomniac** (in-som′ni-ak′), *n.* كەسێك كە تووشی خەوزڕان بووبێ و خەوی لێ نەكەوێ.

**insomuch** (in′sō-much′, in′sə-much′), *adv.* (١) بەڕادەیەك؛ بە ڕادەیەك كە. (٢) ( ~ as )، لەبەرئەوەی؛ چونكە.

**inspect** (in-spekt′), *v.t.* (١) پشكنین؛ بە وردی سەیركردن (بۆ كەم وكووڕی)؛ گەڕان؛ لێ وردبوونەوە:
*( to ~ a house, a car, a suitcase, someone's work, etc.)*
(٢) بەسەركردنەوە: *( to ~ troops)*.

**inspection** (in-spek′shən), *n.* (١) پشكنین؛ بە وردی گەڕان یا سەیركردن (بۆ كەم وكووڕی). (٢) بەسەركردنەوە (لەشكر).

**inspector** (in-spek′tēr), *n.* (١) پشكنیار؛ پشكنەر.
(٢) ئەفسەری بەرزی پۆلیس

-inspectorship *(n.)*.

**inspiration** (in′spə-rā′shən), *n.* (١) هەناسە هەڵكێشان؛ هەناسە وەرگرتن. (٢) سرووش پێدان؛ سرووش؛ وەحی.
(٣) هاندان؛ بزواندن؛ بزوێنەر؛ مێشك بزوێنەر؛ پێشنیاز؛ پێ وتن.

-inspirational *(adj.)*.

**inspire** (in-spīr′), *v.t.* (١) (أ) فووتێکردن؛ فووپیاکردن.

(ب) ژیاندنەوە یا گیان پێدان بە فووپیاکردن.

(٢) هەناسە هەڵکێشان؛ هەناسە وەرگرتن.

(٣) کارتێکردن؛ بزواندن؛ خستنە جموجوول؛ هاندان

(٤) سرووش پێدران لە خوداوە: *( God ~d the Bible.)*.

(٥) لێ بوونەوە؛ بوون بە هۆ؛ ئەنجام دران: *( Kindness ~s love.)*.

(٦) تێدا دروستکردن یا پەیداکردن: *( It ~d fear in their hearts.)*.

***v.i.*** (١) هەناسە هەڵکێشان؛ هەناسە وەرگرتن.

(٢) هاندان؛ بزواندن؛ خستنە جموجوول.

**inspirit** (in-spir′it), *v.t.* ژیاندنەوە؛ بووژاندنەوە؛ جۆشدان؛ دڵخۆش کردن

**instability** (in′stə-bil′ə-ti), *n.* ناسەقامگیری؛ بێ ناسووده‌یی؛ پشێوی؛ شڵەژاوی؛ دانەمرکاوی؛ نەچەسپیوی؛ شلۆقی؛ شڵوشۆقی:

***( ~ in a country, a family, a person, etc.)***

**instable** (in-stā′b'l), *adj.* = unstable.

**install** (in-stôl′), *v.t.* (١) دانان بە فەرمانڕەوا یا کاربەدەستێکی گەورە بە ناهەنگەوە:

***( to ~ a president, a governor, a government, etc.; to ~ in office)***

(٢) جێی خۆ خۆش کردن؛ جێی خۆ کردنەوە و تیا دانیشتن.

(٣) تیا دانان (تەلەفۆن، تەلەکتریك، بەلووعە... هتد).

***( to ~ a telephone, a heating or lighting system in a house)***

**installation** (in′stə-lā′shən), *n.* (١) دانان یا دانران بە فەرمانڕەوا؛ دامەزراندن؛ چەسپاندن (٢) مەکینە و کەرەسەی دانراو یا دامەزراو:

***( a heating, lighting, or telephone ~ )***

(٣) بنکەی سوپا؛ ئۆردوگا: *( military ~s)*.

**installment, instalment** (in-stôl′mənt), *n.* (١) قیست؛ قیستی مانگانە (٢) ئەڵقەی چیرۆکێکی زنجیرەیی (کە بە چەند جارێك دەردەچێ) *( The story was published in ~s.)*.

**installment, instalment** (in-stôl′mənt), *n.* **installation.**

**instance** (in′stəns), *n.* (١) داوا؛ تکا؛ داواکردن. (٢) وێنە؛ نموونە.

(٣) جار؛ کەرەت: *( in the first ~ )*.

(٤) [ Obs. ] هۆ؛ پاڵنەر

(٥) داو؛ دادگا.

***v.t.*** (١) پێشاندان؛ دەرخستن؛ دەرکەوتن. (٢) نموونە هێنانەوە؛ نموونە دان.

**for instance,** بۆ نموونە؛ بۆ وێنە

**instant** (in′stənt), *adj.* (١) پەلە؛ دەبێ دەستبەجێ بکرێ؛ ناخرێتە پشت گوێ (٢) هی ئەم مانگە:

***( in reply to your letter of the 19th ~ )***

(٣) خەریکە ڕوودەدات؛ لە ڕوودانداپە.

(٤) کوتوپڕ؛ دەستبەجێ؛ خێرا.

***( to feel ~ relief after taking a dose of medicine)***

(٥) کوتوپڕ ئامادە دەکرێ (وەك قاوەی ووشکی ئامادەکراو کە تەنها ئاوی دەکرێ بەسەراو دەخورێتەوە)؛ یەکسەری؛ هەناسەیەکی پێ دەچێ:

***( ~ coffee)***

***n.*** (١) خولەك؛ چرکە؛ هەناسە (کات): *( I will be back in an ~ . )*.

(٢) کاتێکی تایبەتی

**on the instant,** خێرا؛ یەکسەر؛ کوتوپڕ

**the instant,** هەر کە؛ کوتوپڕ کە؛ یەکسەر کە:

***( I will let you know the instant he arrives.)***

**instantaneous** (in′stən-tā′ni-əs), *adj.* (١) یەك چرکەیی؛ یەك هەناسەیی؛ لە یەك هەناسەدا دەبێ یا ڕوودەدات

(٢) کوتوپڕی؛ یەکسەری؛ دەمودەستی؛ خێرا: *( an ~ reply)*.

-instantaneously *(adv.)*.

**instanter** (in-stan′tēr), *adv.* کوتوپڕ؛ یەکسەر؛ دەمودەست.

**instantly** (in′stənt-li), *adv.* (١) بەپەلە.

(٢) دەستبەجێ؛ زوو بە زوو؛ کوتوپڕ؛ یەکسەر؛ دەمودەست؛ خێرا:

***( I went there ~ to help.)***

**instead** (in-sted′), *adv.* لەباتی؛ لەجیاتی؛ لەبری؛ لەبریتی:

***( Since we had no honey, we used sugar ~. ; I asked for an orange, but she gave me an apple ~. )***

**instead of,** لەباتی؛ لەبریتی؛ لەبری؛ لەجیاتی؛ لەجێی:

***( I will go instead of you.)***

**instep** (in′step′), *n.* (١) شانەی پێ

(٢) ئەو بەشەی گۆرەوی یا پێڵاو کە شانەی پێ دادەپۆشێ.

(٣) دیوی پێشەوەی لاقی ئەسپ لەنێوان پاشوو قولەقاچدا.

**instigate** (in′stə-gāt′), *v.t.* هاندان؛ پاڵ پێوەنان؛ جۆشدان؛ نانەوە (شەڕ)؛ فیتدان؛ ڕێ بۆ خۆش کردن:

***( to ~ a rebellion, a quarrel, etc.; to ~ workers to go out on a strike)***

-instigation *(n.)*; instigator *(n.)*.

**at the instigation of,** بە هاندانی (فلان کەس یا لا)؛ بەفیتی

**instill, instil** (in-stil′), *v.t.* (١) تێکردن دڵۆپ دڵۆپ

(٢) ( ~ in; ~ into )، خستنە مێشکەوە بەرەبەرە؛ لە مێشکدا چەسپاندن یا ناشتن.

-instillation *(n.)*; instillment *(n.)*.

**instinct** (in′stiŋkt), *n.* (١) زگماك؛ هەست و هۆشی؛ زگماکی یا سرووشتی: *( Suckling is an ~ in mammals.)*.

(٢) بەهرە؛ توانای زگماکی؛ سەلیقە:

***( to have an ~ for music; She has an ~ for doing the right thing.)***

***adj.*** پڕ لە: *( ~ with emotions)*.

**instinctive** (in-stiŋk′tiv), *adj.* زگماکی؛ خۆیی؛ لە خۆوە

***( an ~ reaction)***

-instinctively *(adv.)*.

**instinctual** (in-stiŋk′choo-əl), *adj.* زگماکی؛ خۆیی.

**institute** (in′stə-toot′, in′stə-tūt′), *v.t.* (١) دامەزراندن؛ دانان؛ هێنانەکایەوە: *( to ~ a custom or rule)*.

(٢) دەستپێکردن؛ کردن: *( to ~ an investigation, changes, etc.)*.

(٣) دامەزراندن یا دانان لەسەر کار؛ دانان بە کاربەدەستی گەورە

***n.*** (١) (أ) پەیڕەو؛ ڕێباز؛ بنەما؛ یاسا؛ دەزگا.

(ب) کورتەی ئەم پەیڕەو یا یاسایانە. (٢) (أ) دانشگا؛ ئامۆژگا.

(ب) خانووی دانشگایەك. (ج) دانشگای پیشەسازی

(د) دانشگایەکی بەرزی لێکۆڵینەوە و خوێندن.

(هـ) بەرنامەیەکی کورتی تایبەتی خوێندن.

**institution** (in′stə-too′shən, in′stə-tū′shən), *n.* (١) دانان؛ دامەزراندن؛ هێنانەکایەوە؛ دەستپێکردن. (٢) نەریت؛ خوونەریتی کۆمەڵایەتی؛ پەیوەندی و داو دەزگای کۆمەڵایەتی:

***( Marrige as an ~ is under attack.)***

(٣) (أ) ئامۆژگا؛ دانشگا: *( ~s of higher learning)*

(ب) دەزگا (دانشگا، قوتابخانە، مزگەوت، کڵێسە، بەندیخانە، شێتخانە، خەستەخانە... هتد)

(٤) شوێن یا خانووی ئەم جۆرە دەزگایە

(٥) شێتخانە؛ بەندیخانە

(٦) [Colloq.]، کەسێك یا شتێك کە بووبێ بە بەشێکی هەمیشە لە ئارادای ژیانی کۆمەڵایەتی: *( He is an ~. )*

(٧) کۆمەڵە یاسا و پەیڕەوێك

-institutional *(adj.)*.

**institutionalism** (in′stə-tū′shən-'l-iz'm), *n.* (١) بڕوا پێ بوون و لایەنگیرکردنی دەزگاکانی کۆمەڵ بەتایبەتی ئاین. (٢) بەخێوکردن و

ئاگا لێ بوونی بێ کەسان و هەژاران لەلایەن دەزگا کۆمەڵایەتییەکانەوە.

**institutionalize** (in´stə-tū′shən-'l-īz´), *v.t.* (١) کردن بە دەزگایەکی چەسپیو لە کۆمەڵدا. (٢) خستنە شێتخانە یا بەندیخانەوە.

**instruct** (in-strukt′), *v.t.* (١) فێرکردن؛ وانە ووتنەوە؛ پەروەردەکردن لە قوتابخانەدا (٢) ئامۆژگاری کردن؛ بۆ ڕوون کردنەوە؛ پێ ڕاگەیاندن؛ ڕابەری کردن: ***( The judge ~s the jury.)*** . (٣) فەرمان پێدان؛ پێ ووتن:
***( The officer ~ed his soldiers to shoot.)***

**instruction** (in-struk′shən), *n.* (١) فێرکردن؛ پەروەردەکردن (قوتابخانە)؛ وانە ووتنەوە (٢) زانیاری؛ زانست (٣) ... فەرمان؛ ئامۆژگاری؛ ڕابەری؛ ڕێنمایی

-instructional *(adj.)*.

**instructive** (in-struk′tiv), *adj.* فێرکەر؛ بەکەڵك (پەند)؛ چاوکەرەوە:
***( an ~ lesson, experience, book, trip, etc.)***

**instructor** (in-struk′tēr), *n.* مامۆستا؛ وانەبێژ؛ فێرکار؛ مامۆستای پلە نزمی کۆلیج یا زانکۆ

**instructorship** (in-struk′tēr-ship´), *n.* پلەی مامۆستایەتی؛ مامۆستایی؛ کاری مامۆستایەتی

**instrument** (in′stroo-mənt), *n.* (١) هۆ؛ مرۆڤ؛ شت؛ دەسکەلا؛ پێکار ***( to be the ~ of a person's death)*** .
(٢) ئامێر (بەتایبەتی هی زانیاری یا ووردەکاری)؛ پێکار
(٣) ئامێری مۆسیقی ***( a musical ~ )*** .
(٤) بروانامەیەکی یاسایی (کومپیالە، سەنەد، قونتەرات، تاپۆ).
*v.t.* (١) نووسین یا ئامادەکردنی بروانامەیەکی یاسایی.
(٢) ڕێکخستن و گونجاندنی ئاواز و ئامێری مۆسیقی.

**instrumental** (in´stroo-men′t'l), *adj.* (١) بەکەڵك؛ گرنگ؛ بەکار؛ ئەنجامدەر؛ یارمەتیدەر: ***( to be ~ in finding work for a friend)*** .
(٢) (أ) ئامێری (مۆسیقا)؛ بە ئامێر لێدەدرێ یا دەژەنرێ: ***( ~ music)*** .
(ب) بۆ ئەوە نووسراوە یا دانراوە کە بە ئامێر لێ بدرێت (مۆسیقا).

**instrumentalism** (in´stroo-men′t'l-iz'm), *n.* تیۆرییەکە کە دەڵێت بیروباوەڕ تەنها هۆیەکە بۆ کردنی شتێك وە نرخی بیروباوەڕ بە سەرکەوتنی کردارەکەوە بەندە.

**instrumentalist** (in´stroo-men′t'l-ist), *n.* (١) موسیقاژەن؛ مۆسیقالێدەر (٢) لایەنگری تیۆری " instrumentalism ".

**instrumentality** (in´stroo-men-tal′ə-ti), *n.* (١) کەڵك بوون؛ کاریگەری؛ بە ئەنجام گەیەنەری (٢) هۆ

**instrumentation** (in´stroo-men-tā′shən), *n.* (١) ئامێر بەکارهێنان لە کارێکدا. (٢) ڕێکخستن و گونجاندنی ئاواز لەگەڵ ئامێری مۆسیقادا؛ ئاوازگەری (٣) لێکۆڵینەوە و پێشخستن و دروستکردنی ئامێری زانیاری

**instrument flying,** فڕینی فڕۆکە بە ئامێر

**instrument panel,** دەشبورل؛ دۆلاب یا تەختەی پارچەی لێخوڕین (فڕۆکە، ئوتومبیل)

**insubordinate** (in´sə-bôr′d'n-it), *v.t.* لێ هەڵگەڕانەوە؛ بەقسەنەکردن؛ یاخی بوون؛ بە گوێ نەکردن

**insubordination** (in´sə-bôr′d'n-ā′shən), *n.* لێ هەڵگەڕانەوە؛ بەقسەنەکردن؛ یاخی بوون؛ بە گوێ نەکردن؛ قسە پێ ووتنەوە

**insubstantial** (in´səb-stan′shəl), *adj.* (١) خەیاڵی؛ بوونی نییە (٢) ناپتەو؛ لاواز؛ بێ هێز؛ شلۆق؛ هیچ؛ کەم.

**insufferable** (in-suf′ēr-ə-b'l), *adj.* لەگەڵی دەرنابرێ؛ لەگەڵی هەڵناکرێ؛ لە ووزە بەدەر ***( ~ insults; an ~ person)*** .

**insufficiency** (in´sə-fish′ən-si), *n.* (١) بەش نەکردن؛ کەمی؛ کەموکووڕی (٢) شتێکی کەم یا بەش نەکردوو

**insufficient** (in´sə-fish′ənt), *adj.* کەم؛ ناتەواو؛ بەش ناکات؛ بەس نییە؛ کەموکووڕ

-insufficiently *(adv.)*.

**insular** (in′sə-lēr, in′syoo-lēr), *adj.* (١) دوورگەیی
(٢) لە دوورگە ژیاو؛ دوورگە نیشتەنی.
(٣) جیا (وەك دوورگە)؛ دابڕاو؛ دوور؛ پچڕاو؛ گۆشەگر.
(٤) بیرومێشك تەسك.
(٥) تایبەتی بە شانە و تێشووی پەڕ؛ لا تەریك، یا جیا.

-insularity *(n.)*.

**insulate** (in′sə-lāt´, in′syoo-lāt´), *v.t.* (١) جیاکردنەوە؛ دابڕین؛ دابڕکردن؛ لێ پچڕاندن. (٢) جیاکردنەوە و پاراستن؛ دەورگرتن یا داپۆشین بە ماددەیەکی نەلەکتریك، گەرما، سەرما، یا دەنگ نەگەیێن.

**insulation** (in´sə-lā′shən, in´syoo-lā′shən), *n.* (١) پاراستن؛ جیاکردنەوە و پاراستن؛ دەورگرتن و پاراستن بە ماددەیەکی نەلەکتریك، گەرما، سەرما، یا دەنگ نەگەیێن؛ بابڕکردن؛ هەوابڕی
(٢) ماددەی نەگەیەنەر، جیاکەر، یا لادەر.

**insulator** (in′sə-lā´tēr, in′syoo-lā´tēr), *n.* نەگەیێنی؛ نەگەیەنەری نەلەکتریکی.

**insulin** (in′sə-lin, in′syoo-lin), *n.* ئەنسولین: دەرمانی نەخۆشی شەکرە.

**insult** (in′sult), *n.* ڕووشکاندن (بە ووتە یا کردەوە)؛ قسەی سووك؛ سووکی.
*v.t.* (١) ڕووشکاندن (بە کردەوە یا بە قسە)؛ شکاندن؛ قسەی سووك پێ ووتن؛ سووك کردن. (٢) [Obs.]، هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
*v.i.* [Archaic]. بە لووت بەرزی و لەخۆباییتی ڕەفتار نواندن.

**insuperable** (in-sū′pēr-ə-b'l), *adj.* زاڵبوونی بەسەردا بۆ نییە؛ ناشکێنرێ؛ کۆڵی پێ نادرێ: ***( ~ barriers, difficulties, etc.)***

**insupportable** (in´sə-pôr′tə-b'l), *adj.* (١) لەگەڵی هەڵناکرێ؛ لە ووزە بەدەر. (٢) ناڕەوا؛ بێ بناغە؛ بێ پاڵپشت: ***( an ~ claim)***

**insuppressible** (in´sə-pres′ə-b'l), *adj.* ناشارێتەوە؛ دابین ناکرێ؛ دانامرکێتەوە؛ ڕێی لێ ناگیرێ؛ دەمکوت ناکرێ.

**insurable** (in-shoor′ə-b'l), *adj.* بیمە دەکرێت.

**insurance** (in-shoor′əns), *n.* (١) بیمە؛ پاراستن
(٢) نرخی بیمەکردن؛ ئەو پارەیەی دەدرێ بە بیمە.
(٣) ڕادەی بیمەکردنی ژیان، شتوومەك، خانوو... هتد.
(٤) بیمەکاری؛ پیشەوکاروباری بیمەکاری.

**insure** (in-shoor′), *v.t.* (١) دڵنیابوون؛ پشت ئەستوور بوون؛ دووپاتکردنەوە: ***( Please ~ the accuracy of your reports.)***
(٢) مسۆگەرکردن؛ گەرەنتی کردن: ***( Your degree will ~ you a job.)*** .
(٣) پاراستن: ***( Care ~s one against error.)*** .
(٤) بیمەکردن: ***( to ~ a car, a house, etc.)*** .
*v.i.* بیمەکردن؛ بیمە پێدان یا بۆ کردن

**insured** (in-shoor′d), *n.* بیمەکراو: کەسێك کە ژیانی یا سەرمایەو شتوومەکی بیمە دەکات.

**insurer** (in-shoor′ēr), *n.* بیمەکەر: کۆمپانییەك یا کەسێك کە ژیان یا سەرمایەو شتوومەکی خەڵك بیمە دەکات.

**insurgence** (in-sūr′jəns), *n.* شۆڕش؛ ڕاپەڕین؛ یاخی بوون.

**insurgency** (in-sūr′jən-si), *n.* = **insurgence.**

**insurgent** (in-sūr′jənt), *adj.* شۆڕشگێڕ؛ یاخی بوو؛ یاخی.
*n.* کەسێکی شۆڕشگێڕ؛ کەسێکی یاخی؛ یاخی.

**insurmountable** (in´sēr-moun′tə-b'l), *adj.* زاڵبوونی بەسەردا بۆ نییە؛ ناشکێنرێ: ***( ~ difficulties)*** .

-insurmountability *(n.)*.

**insurrection** (in´sə-rek′shə), *n.* یاخی بوون؛ شۆڕش؛ ڕاپەڕین.

-insurrectionary *(adj. & n.)*; insurrectionist *(n.)*.

**insusceptible** (in´sə-sep′tə-b'l), *adj.* (١) کاری تێ ناکرێ: ***( ~ to flattery)***

(۲) تووش نابێ (نەخۆشی) *( ~ to disease)*

**intact** (in-takt′), *adj.* دەست لێوە نەدراو؛ نەگۆڕاو؛ ساغ؛ هیچی لێ کەم نەکراوەتەوە؛ سەرمۆر؛ بێ گەرد: *( to live on the interest and keep one's capital ~ ; to find or leave something ~ )*

**intaglio** (in-tal′yō, in-täl′yō), *n.* (۱) نەقش (نیگاری هەڵکەندراو لەناو یا لە ژێر ڕووی شتێکدا.
(۲) بەردێکی بەنرخی نەقش لەسەر هەڵکەنراو (لە ژێر ڕوویەکەوە).
(۳) نەقشی وەها هەڵکەندن.

*v.t.* نەقش هەڵکەندن لەناو یا لە ژێر ڕووی شتێکدا.

**intake** (in′tāk′), *n.* (۱) وەرگرتن؛ هێنانە ژوورەوە.
(۲) ئەوەندەی وەردەگیرێ، دێتە ژوورێ، یا پیا دەڕوات: *( A small pipe has little ~ . )*
(۳) دەم (بۆری، خەنەق)؛ کون: *( The sewer ~ was too small.)* .
(٤) تەسکبوونەوە؛ بچووك بوونەوە
(٥) (ا) وورەی وەرگیراو یا پێدراو (مەکینە)؛ سووتەمەنی.
(ب) خواردەمەنی خوراو.

**intangible** (in-tan′jə-b′l), *adj.* بە دەست ناگیرێ؛ بەردەست ناکەوێ؛ هەستی پێ ناکرێ؛ کەم؛ لێڵ؛ ناچێتە مێشکەوە؛ تێگەیشتنی گرانە: *( an ~ amount, idea, reward, etc.)* .

-**intangibility** *(n.)*.

**integer** (in′tə-jēr), *n.* (۱) شتێکی تەواو؛ هەموو، یا گشت.
(۲) ژمارەیەکی تەواو، واتە کەرت نەبێ (بیرکاری).

**integral** (in′tə-grəl), *adj.* (۱) پێویست؛ تەواوکەر؛ لێ جیا نەکراوە؛ تایبەتی بە بەشێك کە جیا نەکرێتەوە: *( an ~ part)* .
(۲) تەواو؛ گشت؛ هەموو (۳) تایبەتی بە ژمارەی تەواو (بیرکاری).

*n.* (۱) شتێکی تەواو، هەموو، یا گشت (۲) تەواوکاری (بیرکاری).

**integrant** (in′tə-grənt), *n.* بەشێکی لێ جیا نەبووەوە.

**integrate** (in′tə-grāt′), *v.t.* (۱) تەواوکردن؛ گشتکردن.
(۲) کردن بەیەك؛ یەك پێگرتن؛ هێنانەناو؛ کردن بە بەشێك لە: *( to ~ a group into the society)*
(۳) سەرجەم کردن یا پیشاندان.
(٤) جیاوازی لابردن؛ جیاوازی نەکردن؛ دەرگاکردنەوە بۆ هەموو نەتەوەیەك: *( to ~ the schools)*
(٥) تەواوکردن (بیرکاری).

*v.i.* بوون بەیەك؛ یەکگرتن

**integration** (in′tə-grā′shən), *n.* (۱) یەکگرتن؛ یەك پێگرتن؛ یەکخستن (۲) جیاوازی لابردن؛ جیاوازی نەهێشتن و دەرگاکردنەوە بۆ هەموو ڕەگەزێك *( school ~ in southern United States)* .
(۳) تەواوکاری (بیرکاری).
(٤) یەکخستن و گشتکردنی کەسێك (دەروونناسی).

**integrator** (in′tə-grā′tēr), *n.* (۱) یەکخەر؛ یەك پێگر.
(۲) ئامێری ژماردنی تەواوکاری (بیرکاری).

**integrity** (in-teg′rə-ti), *n.* (۱) هەموویی؛ گشتی؛ گشت.
(۲) ساغی (باشی؛ بێگەردی؛ پارچە پارچە نەکراوی.
(۳) ڕاستگۆیی؛ ڕاستی؛ سەرڕاستی؛ ڕاستی و درووستی؛ ناموس؛ چاك ڕەوڕەوشتی *( He is a man of ~ . )* .

**integument** (in-teg′yoo-mənt), *n.* پێست؛ توێکڵ؛ توێك؛ قاوغ؛ پێستە

**intellect** (in′tə-lekt′, in′t'l-ekt′), *n.* (۱) مێشك؛ توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتن و لێکۆڵینەوە. (۲) زیرەکی؛ زرنگی؛ مێشك باشی؛ لێهاتوویی؛ دانایی؛ توانای بەرز: *( a man of ~ )* .
(۳) (ا) مێشکێکی باش (ب) کەسێکی زیرەك.
(ج) مێشکە باشەکان؛ مرۆڤە زیرەکەکان

**intellection** (in′tə-lek′shən), *n.* (۱) بیرکردنەوە (۲) بیر

**intellectual** (in′tə-lek′choo-əl), *adj.* (۱) مێشکی؛ هی مێشك؛ تایبەتی بە مێشك؛ هی ڕۆشنبیری: *( ~ activities)* .
(۲) پێویست بە بیرکردنەوە کەر؛ بیرکەرەوە؛ مێشك بەکارهێن.
(۳) زیرەك؛ ڕۆشنبیر؛ ڕووناکبیر.

*n.* ڕۆشنبیر؛ ڕووناکبیر؛ کەسێکی ڕۆشنبیر.

-**intellectually** *(adv.)*.

**intellectualism** (in′tə-lek′choo-əl-iz'm), *n.* (۱) ڕۆشنبیری؛ ڕۆشنبیرێتی؛ ڕووناکبیرێتی. (۲) ئەو فەلسەفەیەیە کە دەڵێت: سەرچاوەی هەموو زانینێك مێشك و بیرکردنەوەیە نەك هەست.

**intellectualist** (in′tə-lek′choo-əl-ist), *n.* کەسێك کە لە ڕادە بەدەر خەریکی کاروباری مێشکییە.

**intellectualize** (in′tə-lek′choo-əl-īz′), *v.t.* بۆچوون و لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی شت لە ڕێی مێشك و بیرکردنەوەوە نەك لە ڕێی هەستەوە.

**intelligence** (in-tel′ə-jəns), *n.* (۱) مێشك؛ توانای بیرکردنەوە و تێگەیشتن. (۲) زیرەکی؛ مێشك باشی؛ بە توانایی.
(۳) (ا) [Rare]، کەسێکی زیرەك؛ بوونەوەرێکی بە مێشك.
(ب) [I-]، فریشتە. (٤) دەنگوباس؛ سووسە.
(٥) سووسەکردن؛ جاسووسی کردن (بەتایبەتی لە کاروباری سوپا و پۆلیسیدا)
(٦) دەزگای سووسەکردن؛ دەزگای جاسووسی؛ سەرجەمی جاسووسان

**intelligence department ( or bureau ),** بەڕێوەبەرێتی سووسەکردن؛ فەرمانگەی سووسە.

**intelligent quotient,** زیرەکی پێو؛ ژیری پێو؛ پلەی زیرەکی یا ژیری. (بە کورتی: I.Q. ): *( to have a high (or low) I.Q.)* .

**intelligent test,** تاقیکردنەوەی زیرەکی.

**intelligent** (in-tel′ə-jənt), *adj.* (۱) مێشکدار.
(۲) زیرەك؛ زانا؛ دانا؛ بەمێشك: *( an ~ person)* .
(۳) زیرەکانە؛ زانایانە: *( an ~ answer, approach, etc.)* .
(٤) بەئاگا؛ ئاگادار؛ تێگەیشتوو.

**intelligentsia** (in-tel′ə-jent′si-ə), *n.* چینی ڕۆشنبیرانی کۆمەڵ؛ ڕۆشنبیران.

**intelligible** (in-tel′i-jə-b'l), *adj.* (۱) تێگەیشتراو؛ دیار؛ ڕوون
(۲) تێگەیشتراو تەنها بە مێشك (فەلسەفە)؛ مێشکی؛ تەنها لە مێشکدایە

-**intelligibility** *(n.)*; **intelligibly** *(adv.)*.

**intemperance** (in-tem′pēr-əns), *n.* (۱) زیادەڕۆیی (بەتایبەتی لە جڵەوی ئارەزوو شل کردندا)؛ لە ئەندازە بەدەری؛ خۆ بۆ نەگیران؛ تووڕەیی
(۲) مەی زۆر خواردنەوە.

**intemperate** (in-tem′pēr-it), *adj.* (۱) جڵەو بۆ ئارەزوو شلکەر؛ زیادەڕۆ؛ بەر بۆ خۆ بەرەڵاکەر (۲) تووڕە؛ تووڕەوتڕۆ؛ تەنگەجیکڵانە.
(۳) توندوتییژ؛ قایم: *( an ~ wind)* .
(٤) مەی زۆر خۆرەوە.

**intend** (in-tend′), *v.t.* (۱) نیازبوون؛ بەتەمابوون؛ ویستن؛ لەسەر سووربوون؛ مەبەست بوون. (۲) بۆ مەبەستێك کران یا ئامادەکردن؛ بەو نیازە کران: *( The cake was ~ed for the party.)* .
(۳) مانا وابوون؛ نیشانەبوون
(٤) [Archaic]، ئاراستەکردن.

*v.i.* نیازبوون؛ بەتەمابوون.

**intended** (in-ten′did), *adj.* (۱) دەسەنقەست؛ بە دەسەنقەست کراو.
(۲) هی دواڕۆژ؛ بەتەمابوو (ژنهێنان): *( an ~ wife)* .

*n.* [Colloq.]. دەزگیران؛ ژن یا مێردی دواڕۆژ؛ هاوسەری دواڕۆژ.

**intense** (in-tens′), *adj.* (۱) توندوتیژ؛ تیژ؛ زۆر؛ بەهێز؛ زیادەڕۆ: *( ~ light, heat, pain, etc.)*
(۲) ماندووکەر؛ توندوتیژ؛ تیژ؛ بەدڵ؛ بەتین: *( ~ thought)* .
(۳) بەهەست؛ هەست تیژ؛ هەست توندوتیژ؛ زووهەڵچوو؛ بەجۆش *( an ~ person)*
(٤) زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ بەتین: *( ~ activity)* .

(٥) تاریك وێنه:

-intensely *(adv.)*; intenseness *(n.)*.

**intensify** (in-ten′sə-fī´), *v.t.* (١) توندوتیژ کردن؛ قایم کردن؛ بەتین کردن؛ بەهێز کردن؛ زۆرکردن؛ پێ لێ هەڵبڕین؛ قووڵ کردن؛ *( to ~ our efforts)*

(٢) تۆخ یا تاریك کردنی جام (وێنەگرتن)

*v.i.* توندوتیژ بوون؛ بەهێزبوون.

-intensification *(n.)*; intensifier *(n.)*.

**intension** (in-ten′shən), *n.* (١) سووربوون لەسەر؛ نیاز؛ مەبەست. (٢) توندوتیژی توندوتیژ کردن؛ زیادەڕۆیی. (٣) مانای زیاد لە مانای بنچینەیی ووشەیەك

**intensity** (in-ten′sə-ti), *n.* (١) توندوتیژی؛ قووڵی (هەست)؛ جۆش؛ تین؛ قایمی؛ توندی (٢) زیادەڕۆیی؛ لە ئەندازە بەدەری؛ زۆری. (٣) تاریکی وێنەیەك. (٤) زەبر یا توندوتیژی (فیزیا).

**intensive** (in-ten′siv), *adj.* (١) توندوتیژکەر؛ زۆرکەر؛ قووڵکەر (٢) توندوتیژ؛ قووڵ (٣) بەرهەم زیادکەر (کشتوکاڵ)؛ تایبەتی بە بەرهەم زیادکردن (٤) بەهێزکەر (ڕێزمان)؛ دووپاتکەرەوە (ووشە):
*( "Awfully" and "terribly" are used as ~ words. e.g. a terribly hot day; an awfully difficult book.)*

*n.* (١) شتێکی توندوتیژکەر یا بەهێزکەر. (٢) ووشەی بەهێزکەر (ڕێزمان) (ژمارە چوار ببینە)

**intent** (in-tent′), *adj.* (١) تیژ: *( an ~ look)*. (٢) خەریکە پێوەی. *( He was ~ on his studies.)*. (٣) سوور لەسەر: *( He was ~ on going.)*.

*n.* (١) نیاز؛ مەبەست *( with ~ to kill)*. (٢) (أ) ئەمنج؛ هیوا. (ب) [Obs.]. مانا؛ واتا

**to ( or for ) all intents and purposes,** هەرجۆنێك سەیری بکەیت یا بیگری؛ لە هەموو ڕوویەکەوە یا بارێکەوە؛ لە ڕاستیدا.

**intention** (in-ten′shən), *n.* (١) نیاز؛ مەبەست؛ بەتەما بوون. (٢) (أ) ئەمنج؛ هیوا: *( what is your ~ ?)* (ب) (*pl.*) نیازی ژنهێنان و شووکردن (٣) [Archaic]. مانا؛ واتا. (٤) شێوەی بۆچوون یا تێگەیشتن (ژیریێژی). (٥) برین سارێژبوون.

**intentional** (in-ten′shən-'l), *adj.* دەسەنقەست

**intentionally** (in-ten′shə-'l-i), *adv.* بە دەسەنقەست

**inter** (in-tūr′), *v.t.* ناشتن؛ مر-ور.

**inter-** (in′tẽr), پێشگرێکە بەمانای: (١) لەنێوان؛ لەناو؛ لە ناوەند؛ نێو: *( international)* (٢) پێکەوە؛ لەسەر یەکتر (کارتێکردن)؛ دوولایی: *( interact)* .

**interact** (in´tẽr-akt′), *v.i.* کار لەیەك کردن؛ کارلێکردن؛ تێکەڵاوبوون

**interaction** (in´tẽr-ak′shən), *n.* کار لەیەك کردن؛ کار لەیەکتر کردن؛ تێکەڵاوبوون؛ تێکەڵاوی.

**interbreed** (in´tẽr-brēd′), *v.t.* زاووزێ پێ کردن یا لەیەك- چاك کردنی هەمەچەشنەی گیاندارو ڕووەك.

*v.i.* زاووزێ کردن یا لەیەك چاك بوونی هەمەچەشنەی گیاندارو ڕووەك

**intercede** (in´tẽr-sēd′), *v.i.* (١) تکا بۆ کردن؛ بۆ تێکەوتن *( His colleagues ~d with the dean on his behalf.)*
(٢) ناوبژی کردن؛ چوونە نێوانەوە

**intercellular** (in´tẽr-sel′yoo-lẽr), *adj.* نێوشانە؛ لەنێوشانەدا

**intercept** (in´tẽr-sept′), *v.t.* (١) بەرەوبڕی دانەوە؛ ڕێ پێ گرتن؛ بەرەنگاربوون؛ وەستاندن؛ بەربەرچدانەوە؛ گرتن *( to ~ the enemy, the thief, letters, messages, etc.)*
(٢) ڕاگیرکردن. نیشانەکردن، یا دەورەدان لەنێوان دوو خاڵ، هێڵ یا ڕوودا (بیرکاری)

*n.* هێڵ یا ڕووی دەورەدراو (بیرکاری)

**intercepter** (in´tẽr-sep′tẽr), *n.* = interceptor.

**interception** (in´tẽr-sep′shən), *n.* بەرەوبڕی دانەوە؛ ڕێ پێ گرتن؛ بەرەنگاربوون و وەستاندن.

**interceptor** (in´tẽr-sep′tẽr), *n.* (١) بەرەوبڕی دەرەوە؛ وەستێنەر. (٢) فڕۆکەیەکی جەنگی خێرایە بۆ بەرەوبڕی دانەوەو وەستاندنی فڕۆکەی دوژمن

**intercession** (in´tẽr-sesh′ən), *n.* تکا بۆ کردن؛ بۆ تێکەوتن؛ ناوبژی کردن؛ چوونە نێوانەوە.

-intercessional *(adj.)*; intercessor *(n.)*.

**interchange** (in´tẽr-chānj′), *v.t.* (١) گۆڕینەوە؛ دان و وەرگرتن: *( They ~d presents.)*
(٢) جێگۆڕکێ پێکردن؛ ئاڵوگۆڕکردن.
(٣) بە نۆبەکردن؛ بە نۆرەکردن: *( He ~d work with play.)*

*v.i.* گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن؛ ئاڵوگۆڕبوون.

*n.* (١) گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕکردن. (٢) نۆبە؛ نۆرە؛ نۆبەکاری؛ نۆرەکردن. (٣) دووڕیانەیەك یا چوارڕیانەیەکە وا کراوە کە ڕێگەکان لەیەك نادەن و ئوتومبیل لە ڕێیەکەوە دەچێتە سەر ڕێیەکی تر بەبێ وەستان.

**interchangeable** (in´tẽr-chān′jə-b'l), *adj.* ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرێت؛ لەباتی یەکتر بەکاردەهێنرێن؛ وەك یەك وان: *( ~ tools, words, machines, ideas, etc.)*

-interchangeability *(n.)*; interchangeably *(adv.)*.

**intercollegiate** (in´ẽr-kə-lē′jit), *adj.* نێو دانشگایان؛ نێو زانکۆو کۆلیجەکان: *( ~ sports)* .

**intercom** (in′tẽr-kom´), *n.* [Slang], هۆی نێوپەیوەندی یا پەیوەندی کردنی ناوەکی (فەرمانگە، خانوو، فڕۆکە، پاپۆڕ): *( The pilot made the announcement on the ~ . )*

**intercommunicate** (in´tẽr-kə-mū′ni-kāt´), *v.t.* & *v.i.* پەیوەندی کردن لەگەڵ یەکدا لەناو شوێنێکدا یا شتێکدا.

-intercommunication *(n.)*.

**interconnect** (in´tẽr-kə-nekt′), *v.t.* پێکەوەبەستن.

*v.i.* پێکەوەبەستران.

-interconnection *(n.)*.

**intercontinental** (in´tẽr-kon´tə-nen′t'l), *adj.* (١) نێو-کیشوەر؛ نێو کیشوەران؛ کیشوەران پێکەوەبەست: *( ~ flights)* . (٢) بڕ دەکات لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر: *( ~ missiles)* .

**intercourse** (in′tẽr-kôrs´, in′tẽr-kōrs´), *n.* (١) پەیوەندیی و سەوداگەری نێو وولاتان یا میللەتان یا مرۆڤ؛ ئاڵوگۆڕکردن (شتومەك، بیروڕا)
(٢) گان؛ جووت بوون؛ جووت گرتن؛ چوونەجێ
(بەزۆری ناودەبرێ بە: **sexual intercourse** ).

**interdenominational** (in′tẽr-di-nom´ə-nā′shən-'l), *adj* لەنێو بەشەکان یا لقەکانی ئاینێکدا.

**interdental** (in´tẽr-den′t'l), *adj.* (١) نێو ددانان؛ لەنێو ددانەکاندا. (٢) دەبێژرێ بە سەری زمان لەنێوان دوو ڕیز ددانا. (وەك **th** لە ووشەی: **this** و **think** دا).

**interdepartmental**(in´tẽr-di-pärt´men′t'l), *adj.* نێو-بەشان؛ هی نێوان لقەکان یا بەشەکانی دەزگایەك.

**interdependence** (in´tẽr-di-pen′dəns), *n.* پشت بەیەك بەستن؛ لەسەر یەك بەندبوون؛ هاوبەندی.

**interdependency** (in´tẽr-di-pen′dən-si), *n.* = interdependence.

**interdependent** (in´tẽr-di-pen′dənt), *adj.* پشتیان بە یەکترییە؛ لەسەر یەك بەندن؛ هاوبەند: *( ~ people, countries, groups, etc.)*

**interdict** (in´tẽr-dikt′), *v.t.* (١) قەدەغەکردن؛ یاساغ کردن. (٢) ڕێ لێگرتن؛ بەرەنگاربوون و ڕێ برین و وەستاندنی دوژمن؛ نەهێشتن؛

نەهێلان (٢) بۆ بەش کردن یا دابڕکردنی کڵێسە یا ئەندامێکی لە کاروباری ئاینی (ئاینی کاسۆلیکی).

**n.** (١) فەرمانی قەدەغەکردن. (٢) قەدەغەکردنی کڵێسەیەکی کاسۆلیکی یا ئەندامێکی لە هەڵسان بە هەندێ کاروباری ئاینی

**interdiction** (in´tēr-dik′shən), *n.* قەدەغەکردن؛ ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتن؛ وەستاندن

**interest** (in′tēr-ist, in′trist), *n.* (١) بەش؛ ماف
***( to have an ~ in a piece of property)***
(٢) (...) چاکە؛ قازانج؛ سوود: ***( to look after one's own ~s)*** .
(٣) بەرژەوەندی ***( the business ~s; the steel ~)*** .
(٤) خاترانە؛ دەسەڵات؛ خوایشت.
(٥) خولیا؛ حەزێکی زۆر؛ هەوەس؛ شتی بەتەنگەوەهاتوو:
***( We have similar ~s.; His great ~s in life are music and literature.)***
(٦) گرنگی؛ سەرنج ڕاکێشان ***( a matter of little ~ )***
(٧) قازانج؛ سوو؛ سوود. ***( to pay 6% ~ on a loan)***
(٨) سلاو؛ بە سلاوەوە؛ بە زیادەوە؛ بە خاترانەوە
***( He repaid her kindness with ~ . ; to return a blow with ~ )***
***v.t.*** (١) حەز پێ پەیداکردن؛ مەیل پێ پەیداکردن؛ هەوەس هەڵساندن:
***( I want to ~ him in the plan.)***
(٢) سەرنج ڕاکێشان: ***( The story did not ~ him.)*** .
(٣) حەزلێکردن؛ هەوەس لێ بوون ***( She is ~ed in travelling.)*** .
**in the interest ( or interests ) of,** لەبەر؛ لەبەرخاتری؛ بۆ سوودمەندی؛ بۆ

**interested** (in′tēr-is-tid, in′tə-res´tid), *adj.* (١) بەشدار؛ مافدار (٢) لایەنگر؛ سوودی خۆی تێدایە: ***( an ~ witness)*** .
(٣) حەزکەر؛ بەحەز؛ هەوەسدار؛ بەهەوەس ***( an ~ look)*** .

**interesting** (in′tēr-is-tiŋ, in′tə-res´tiŋ), *adj.* خۆش؛ سەیر؛ سەرنج ڕاکێش؛ ئەنتیکە
***( an ~ man, woman, book, conversation, film, place, town, time, idea, meeting, etc.)***

**interfere** (in´tēr-fēr′), *v.i.* (١) بەیەردا بوون (ئەسپ)؛ قاچ لەیەکدان لەکاتی ڕۆیشتندا (٢) بەیەکدادان؛ لەیەکدان؛ بەیەکداکێشان.
(٣) (ا) دەست کێشانە ناو؛ دەست تێخستن؛ دەست تێوەردان؛ دەست هێنانەڕێ؛ خۆتێهەڵقورتان
***( He ~s in other people's affairs.)***
(ب) کەوتنە نێوانەوە
(٤) داوای مافنامەی داهێنان کردن لەلایەن چەند کەسێکەوە گوایە لەبەر دەستپێشکەری کردن لەو داهێنانەدا
(٥) کارکردنەسەر یەکی شەپۆلی دەنگ یا ڕووناکی (فیزیا).
(٦) ڕێ لێگرتن لە شەپۆلی رادیۆو بەرنامە وەرگرتن
***( to ~ with radio signals)***
**interfere with,** (١) وەستاندن؛ ڕێ لێگرتن؛ ڕێک نەکەوتن لەگەڵ؛ ئەسازان (٢) پەستکردن؛ زیزکردن.

**interference** (in´tēr-fēr′əns), *n.* (١) دەست کێشانە ناو؛ دەست تێخستن؛ دەست تێوەردان؛ خۆتێهەڵقورتان؛ تێ هەڵکوتان؛ تێ هەڵچوون؛ دەستدرێژی. (٢) بەری یاریکەری تر گرتن لەکاتی یاریدا.
(٣) کارکردنەسەر یەکتری شەپۆلی دەنگ یا ڕووناکی (فیزیا)
(٤) ووڕەووڕی سەر رادیۆو تەلەفزیۆن (کە ڕێ دەگرێت لە وەرگرتنی بەرنامەکە بە ساغی)

**interfuse** (in´tēr-fūz′), *v.t.* (١) تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵ کردن لەگەڵ.
(٢) پیاکردن؛ تێکردن.
(٣) هەمووگرتنەوە؛ پیا بڵاوبوونەوە.
***v.i.*** تێکەڵ بوون؛ تێکەڵاوبوون.

**intergrade** (in´tēr-grād′), *v.i.* گۆڕینی بەرد بەرە؛ تێکەڵ بوونی پلەپلەیی

**interim** (in′tēr-im), *n.* ماوە؛ کات، یا ماوەی نێوان دوو ڕووداو.
*adj.* سەردەمی؛ کاتی؛ ساتی
***( an ~ council, president, government, etc.)***
**in the interim,** لەو کاتەدا؛ لەو سەردەمەدا

**interior** (in-têr′i-ēr), *adj.* (١) ناوخۆ؛ ناوخۆیی؛ ناوەوە؛ هی ناوەوە.
(٢) ناوەوەی وڵات، واتە دوور لە سنوور یا کەناری دەریا.
(٣) ناوەکی؛ کەسی؛ تایبەتی بە خۆ؛ تایبەتی؛ نهێنی
***n.*** (١) (ا) بەشی ناوەوە؛ ناوەوە؛ دیوی ناوەوە.
(ب) ناو ژوور؛ ناو خانوو؛ ژوورەوە؛ ناو:
***( the ~ of a house, room, building, etc.)***
(ج) بەشی ناوەوە یا ناوخۆی وڵاتێک.
(د) سرووشتی مرۆڤێک؛ ناوکرۆک؛ ماک؛ گەوهەر
(٢) دیمەن یا وێنەی ناو ژوور یا خانوویەک
(٣) [-I]. کاروباری ناوخۆی وڵاتێک
***( the I~ Minister; the Department ( or Ministry) of the I~ )***

**interior decoration,** هونەری ڕازاندنەوەی ناوماڵ

**interject** (in´tēr-jekt′), *v.t.* هەڵدانە قسە یا دووان؛ پێ بڕین (قسە)؛ تێهەڵقورتان؛ تێخستن: ***( to ~ a question, remark)*** .
-interjector *(n.).*

**interjection** (in´tēr-jek′shən), *n.* (١) تێهەڵقورتان؛ پێ بڕین (قسە)؛ هەڵدان (گفتوگۆ). (٢) باری سەرسامی (ڕێزمان)؛ ووشەی سەرسامی؛ ئامرازی سەرسامی: ***( Good!; Oh!; Alas! )***

**interlace** (in´tēr-lās′), *v.t. & v.i.* چنین؛ لێکهەڵکێشان؛ بەیەکداکردن؛ بەیەکداچوون: ***( ~ing branches)*** .

**interlay** (in´tēr-lā′), *v.t.* (١) خستنە نێوانەوە؛ خستنەناو؛ لەناودا دانان. (٢) ڕازاندنەوە بە شت خستنە نێوانەوە

**interleaf** (in′tēr-lēf´), *n.* (١) پەڕەیەکی سپییە دەخرێتەناو پەرتووکێکەوە بۆ شت تێدا نووسین (٢) نووسراوی ناو ئەم پەڕەیە

**interline** (in´tēr-līn′), *v.t.* تێبینی نووسین لەنێوان دێڕی پەرتووکدا

**interline** (in′tēr-līn´), *v.t.* بەرێکی زیادە لە جل‌وبەرگ دان

**interlink** (in´tēr-liŋk′), *v.t.* پێکەوەبەستن؛ لەیەک گیرکردن (گێر).

**interlock** (in´tēr-lok′), *v.t. & v.i.* (١) پێکەوەبەستن؛ پێکەوەبەستران؛ لێکهەڵکێشان بە جۆرێک کە لێک جیانەبنەوە؛ لەیەک گیرکردن (گێر).

**interlocution** (in´tēr-lō-kū′shən), *n.* دووان؛ گفتوگۆ؛ ووتوێژ؛ دەمەتەقێ؛ قسەکردن پێکەوە

**interlocutor** (in´tēr-lok′yoo-tēr), *n.* دوێنەر؛ قسەکەر؛ گفتوگۆکەر
-interlocutory *(adj.).*

**interlope** (in´tēr-lōp′), *v.i.* (١) دەستدرێژی کردنە سەر بازاڕی کەسێکی تر (٢) دەست خستنەناو کاروباری خەڵکەوە؛ خۆتێهەڵورتان
-interloper *(n.).*

**interlude** (in′tēr-lōōd´, in′tēr-lūd´), *n.* (١) شانۆنامەیەکی کورتی قۆشمەیە پێشکەش دەکرا لەنێوان پەردەکانی شانۆنامەیەکدا هەر بۆ پێکەنین (٢) خۆنوواندنێکە لەنێوان پەردەکانی شانۆنامەیەکدا
(٣) شانۆنامەیەک (٤) پارچە مۆسیقایەکە کە لێدەدرێت لەنێوان بەشەکانی گۆرانی، شانۆنامە، یا خودا پەرستی لە کڵێسەدا
(٥) ماوەی نێوان دوو ڕووداو؛ پشوو؛ ووچان؛ شتێکە کە ئەم ماوەیەی پێ دەبرێتە سەر: ***( ~s of waiting between trains)*** .

**interlunar** (in´tēr-lōō′nēr, in´tēr-lū′nēr), *adj.* لەنێوان مانگی کۆن و تازەدا، واتە ئەو چوارشەوەی مانگی تێدا نابینرێ

**intermarriage** (in´tēr-mar′ij), *n.* (١) ژنهێنان و شووکردن لەنێوان خێزان و تیرەو چین و ڕەگەزی جیاجیادا

(٢) ژنهێنان و شووکردنی ناوخۆیی، واته لەناو خزمی نزیکدا.

**intermarry** (in´tẽr-mar′i), *n.* (١) ژنهێنان و شووکردن لەنێوان خێزان و تیرە و چین و ڕەگەزی جیاجیادا (٢) ژنهێنان و شووکردنی ناوخۆیی، واته لەناو خزمی نزیکدا

**intermediacy** (in´tẽr-mē′di-ə-si), *n.* ناوەندیتی

مام ناوەندیتی

**intermediary** (in´tẽr-mē′di-er´i), *adj.* (١) ناوبژیکەر

(٢) ناوەڕست؛ ناوەڕاستی؛ ناوەندی؛ ناونجی.

*n.* (١) ناوبژیکەر (٢) هۆ؛ ڕێ؛ ڕێگە

(٣) قۆناغ یا شێوەی ناوەندی یا ناوەڕاست.

**intermediate** (in´tẽr-mē′di-it), *adj.* ناوەندی؛ ناوەنجی

*( an ~ school, stage, etc.)*

*n.* (١) شتێکی ناوەندی یا ناوەنجی. (٢) ناوبژیکەر

(٣) ماددەیەکە دروست دەبێ لە قۆناغی ناوەڕاستدا لە ڕێی دروستکردنی دوا بەرهەمەکە (کیمیاگەری)

*v.i.* ناوبژی کردن؛ کەوتنە نێوانەوە؛ ڕێکخستنەوە.

-intermediation *(n.)*; intermediator *(n.)*.

**interment** (in-tũr′mənt), *n.* ناشتن؛ مردوو

**intermezzo** (in´tẽr-med′zō), *n.* (١) نواندنێکی شانۆیی یا مۆسیقایی کورت لەنێوان پەردەکانی شانۆنامە یا ئۆپەرایەکدا.

(٢) پارچەیەک مۆسیقای کورتە کە وەک پرد بەشە گەورەکان بەیەکەوە دەبەستێ.

**interminable** (in-tũr′mi-nə-b'l), *adj.* دوایی نایەت؛ بێ پایان؛ دوایی بێ نایەت؛ بێ بن؛ دووردرێژ

*( an ~ speech, sermon, debate; ~ suffering)*

-interminably *(adv.)*.

**intermingle** (in´tẽr-miŋ′g'l), *v.t.* تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵ کردن

*v.i.* تێکەڵاوبوون؛ تێکەڵ بوون.

**intermission** (in´tẽr-mish′ən), *n.* (١) پچڕان؛ بڕین (کار، دووان)

(٢) ووچان (شانۆنامە، فیلمی سینەما، ئاهەنگ)؛ پشوو؛

*( ~s between acts of a play)*

**intermit** (in´tẽr-mit′), *v.t. & v.i.* بەین بەین وەستان، بڕین، یا پچڕاندن

**intermittent** (in´tẽr-mit′'nt), *adj.* دەمەدەمی؛ دەم دەم؛ ناوبەناو؛ جارجاری؛ پچڕ پچڕ؛ بەین بەین *( ~ fever, pain, rain, activity)*

-intermittence *(n.)*; intermittently *(adv.)*.

**intermittent current,** تەوژمی ئەلەکتریکی پچڕ پچڕی یەکلایی

**intermix** (in´tẽr-miks′), *v.t.* تێکەڵ کردن؛ تێکەڵاوکردن؛ ناوێتەکردن

*v.i.* تێکەڵ بوون؛ تێکەڵاوبوون؛ ناوێتەبوون

-intermixture *(n.)*.

**intern** (in′tẽrn), *n. Also* interne. پزیشکی نیشتەجێ پزیشکێکی تازە دەرچووە، لە خەستەخانە کاردەکات لەژێر چاودێری پزیشکێکی شارەزادا.

*v.i.* کارکردن وەک پزیشکی نیشتەجێ

*v.t.* (١) گرتن ناحەزان یا گومان لێکراوان بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا؛ بەندکردن؛ خستنە بەندیخانەوە.

*( Coountries often ~ aliens in time of war.)*

(٢) کەشتی گلدانەوە یا ڕاگیرکردن لە بەندەردا

*adj.* [Archaic]. ناوخۆیی؛ ناوەکی

**internal** (in-tũr′n'l), *adj.* (١) ناوەکی؛ هی خۆ؛ خۆیی؛ هی ناوەوە؛

*( ~ evidence)*

(٢) ناوخۆ؛ ناوخۆیی وڵات *( ~ revenue, wars, affairs, etc.)*

(٣) هەناوی (نەخۆشی، پزیشکی)؛ ناوەوە؛

*( ~ injuried, bleeding, medicine)*

(٤) دەخورێت (دەرمان)؛ بۆ ناو لەشە *( ~ remedies)*

(٥) دەروونی؛ کەسی؛ تایبەتی بە دەروون و هەست و نەستی کەسێک؛ خۆیی.



-internally *(adv.)*.

**internal-combustion engine,** مەکینەی سووتانی ناوەکی.

**internalize** (in-tũr′n'l-īz´), *v.t.* کردن بە بەشێک لە خۆ و پەیڕەوی کردن (بیروڕا، ڕێبان)؛ ڕێ پێدانی شتی دەرەوە بۆ کارکردنەسەر دەروون و هەست و نەست.

**internal medicine,** پزیشکەوانی هەناوی؛ پزیشکەوانی ناوەکی: ئەو لقەی پزیشکەوانییە کە لە نەخۆشی و چارەکردنی ئەندامی ناوەوەی لەش بەبێ نەشتەرکاری دەکۆڵێتەوە.

**internal revenue,** دەسکەوتی ناوخۆی وڵات (کە زۆربەی لە باجی دەسکەوت و قازانجەوە دێت)

**international** (in´tẽr-nash′ən-'l), *adj.* جیهانی؛ گێتی؛ گێتیتی؛ نێوڵاتان؛ نێومیللەتان: *( an ~ incident, treaty, court)*

*n.* (١) ڕێکخراو یا کۆمەڵەیەکی جیهانی.

(٢) کەسێک کە هاوڵاتی وڵاتێک بێ و نیشتەجێی وڵاتێکی تر بێ.

-internationally *(adv.)*.

**internationale** (in´tẽr-nash′ən-'l), *n.* سروودی بزووتنەوەی چینی کرێکار و سۆشیالیستی جیهان.

**internationalism** (in´tẽr-nash′ən-'l-iz'm), *n.* (١) گێتیتی؛ جیهانێتی. (٢) هاوکاری جیهانی بۆ چاکەی گشتی.

-internationalist *(n.)*; internationality *(n.)*.

**internationalize** (in´tẽr-nash′ən-'l-īz´), *v.t.* خستنەژێر ڕکێف یا چاودێری جیهانەوە؛ کردن بە جیهانی.

-internationalization *(n.)*.

**international law,** یاسای جیهانی (کە هەموو وڵاتێک دەبێت پەیڕەوی بکات لە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی تردا)

**International Phonetic Alphabet, IPA,** ئەلفوبێی دەنگبێژی جیهانیی

**interne** (in′tẽrn), *n.* = **intern.**

**internecine** (in´tẽr-nē′sin, in´tẽr-nē′sin), *adj.* (١) بکوژ؛ کوشندە؛ وێرانکەر؛ خوێنی زۆری تێدا دەڕژێ؛ خوێناوی: *( ~ wars)*

(٢) کوشندەیە بۆ هەردوولا؛ بۆ هەردوولا زیانبەخش.

(٣) تایبەتی بە ناکۆکی ناوخۆ (گەل، کۆمەڵە، حیزب، دەستە).

**internee** (in´tẽr-nē′), *n.* بە دیل گیراوی جەنگ؛ دەستبەسەر- (بەتایبەتی هاووڵاتییەکی بێگانە لەکاتی جەنگدا)؛ گیراو؛ دیل

**internist** (in-tũr′nist), *n.* پزیشکی هەناوی؛ پزیشکی نەخۆشی ناوەکی.

**internment** (in-tũrn′mənt), *n.* گرتن یا گیرانی هاووڵاتی بێگانە لەکاتی جەنگدا؛ خستنە بەندیخانەوە؛ دەستبەسەرکردن (بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا).

**internship** (in′tẽrn-ship´), *n.* (١) ئیش و کار و پلەی پزیشکی نیشتەجێ لە خەستەخانەدا (٢) ماوەی کارکردنی پزیشکی نیشتەجێ لە خەستەخانەدا.

**internuncio** (in´tẽr-nun′shi-ō´), *n.* (١) ناوبژیکەر؛ نوێنەر. (٢) نوێنەری دیبلۆماسی پلەیەک لە خوار باڵیۆزەوەی پاپا لە وڵاتێکدا

**interpellate** (in´tẽr-pel′āt, in-tũr′pi-lāt´), *v.t.* لێپرسینەوەی کاربەدەستی گەورەی میری لە پەرلەماندا.

-interpellation *(n.)*.

**interpenetrate** (in´tẽr-pen′ə-trāt´), *v.t.* پیاچوون؛ تێچوون؛ تێخستن؛ پیاکردن؛ چوونە ناوی ناوەوە؛ هەمووگرتنەوە؛ بە تەواوی چوونە ژوورەوە.

*v.i.* چوونە ناو یەکتری‌یەوە؛ بەیەکداچوون

-interpenetration *(n.)*.

**interphone** (in′tẽr-fōn´), *n.* تەلەفۆنی ناوخۆ (فەرمانگە، فڕۆکە).

**interphase** (in′tẽr-fās´), *n.* ماوەی نێوان دوو بەشبوونی شانەیەک.

**interplanetary** (in´tẽr-plan′ə-ter´i), *adj.* هی نێوان

ئەستێرەکان

**interplay** (in′tẽr-plā′), *n. & v.i.* کارکردنەسەر یەك

**interpolate** (in-tũr′pə-lāt′), *v.t. & v.i.* (١) گۆڕین، تێکدان، یا دەست تێوەدانی دەقی وتار، چیرۆك، نووسراو، یا پەڕتووکێك بە ووشەو ڕستەی تازەو زیادە تێخستنی. (٢) خستنەناو شتی ترەوە؛ شتی زیادە خستنەناو

-**interpolation** *(n.).*

**interpose** (in′tẽr-pōz′), *v.t.* (١) تێخستن؛ خستنە نێوانەوە؛ خستنەناو (٢) دەست کێشانە ناو؛ خۆتێهەڵقورتان

(٣) قسە پێ برین؛ هەڵدانە قسە؛ تێبینی کردن لەکاتی گفتوگۆدا:

*( to ~ a remark, question, or objection)*

*v.i.* (١) هاتنە نێوانەوە (٢) دەست کێشانە ناو؛ خۆتێهەڵقورتان.

(٣) قسە پێ برین؛ هەڵدانە قسە

-**interposition** *(n.).*

**interpret** (in-tũr′prit), *v.t.* (١) مانا لێکدانەوە؛ ڕوونکردنەوە.

(٢) گۆڕین لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر (بە دەم یا بە زار): *( to ~ a speech)* .

(٣) لێکدانەوە *( He ~ed the silence as contempt.)* .

*v.i.* گۆڕین لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر (بە دەم یا بە زار)؛ گۆڕینی گفتوگۆ یا ووتاری قسەکەرێك بۆ زمانی گوێگرەکانی.

-**interpretative** *(adj.).*

**interpretation** (in-tũr′pri-tā′shən), *n.* (١) لێکدانەوە؛ ڕوونکردنەوە (٢) بۆچوون؛ ڕا

(٣) گۆڕین لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بە دەم.

**interpreter** (in-tũr′pri-tẽr), *n.* (١) وەرگێڕ؛ تەرجومان؛ کەسێك کە بە دەم گفتوگۆ یا ووتاری قسەکەرێك دەگۆڕێت بۆ زمانی گوێگرەکانی.

**interracial** (in′tẽr-rā′shəl), *adj.* هی نێو ڕەگەزان؛ نێو ڕەگەزی

**interrelate** (in′tẽr-ri-lā′t), *v.t. & v.i.* پێکەوەبەستران؛ پەیوەندی‌یەکی نزیك هەبوون پێکەوە.

-**interrelation** *(n.)*; **interrelationship** *(n.).*

**interrelated** (in′tẽr-ri-lā′tid), *adj.* پێکەوە بەستراو؛ پەیوەندی‌یەکی نزیکیان هەیە پێکەوە.

**interrogate** (in-ter′ə-gāt′), *v.t. & v.i.* پرسیارلێکردن بە ووردی‌و دوورودرێژی (دادگا، پۆلیسخانە): *( He ~d the witness.)* .

**interrogation** (in-ter′ə-gā′shən), *n.* پرسیارلێکردن بە ووردی‌و دوورودرێژی (دادگا، پۆلیسخانە): *( The ~ took a long time.)* .

**interrogation mark** ( or **point** ), = question mark.

**interrogative** (in′tə-rog′ə-tiv), *adj.* (١) پرسیارکەر؛ پرسیارکەری (٢) لە پرسیارکردندا بەکاردەهێنرێت (ڕێزمان).

*n.* ووشەی پرسیارکردن (ڕێزمان): *( what?; where?; why?)* .

**interrogator** (in-ter′ə-gā′tẽr), *n.* پرسیارکەر (بەتایبەتی لە دادگا، پۆلیسخانە، یا گرتووخانەدا).

**interrogatory** (in′tə-rog′ə-tôr′i, in′tə-rog′ə-tō′ri), *adj.* وەك هی پرسیارلێکردن لە پۆلیسخانەو دادگادا: *( an ~ tone)* .

*n.* پرسیارێك یا چەند پرسیارێك (بەتایبەتی کە ئاراستەی گومانبارێك بکرێ).

**interrupt** (in′tə-rupt′), *v.t.* (١) قسە پێ بڕین

*( to ~ a speaker)*

(٢) پچڕاندن (بەردەوامی کارێك)؛ وەستاندن؛ ڕێ لێگرتن.

*v.i.* قسە پێ بڕین

**interrupted** (in′tə-rup′tid), *adj.* (١) پچڕ پچڕ

(٢) ئارێك (زیوارناسی)

**interrupter, interruptor** (in′tə-rup′tẽr), *n.* (١) قسە پێ بڕ؛ خۆتێهەڵقورتێنەر (٢) ئامێری بڕینی تەووژمی ئەلەکتریکی بەشێوەیەکی سەردەمی و ئۆتۆماتیکی

**interruption** (in′tə-rup′shən), *n.* (١) قسە پێ بڕین؛ پچڕان- گفتوگۆ، کار)؛ بڕین (٢) شتێك کە کارێك یا ڕووداوێك دەبڕێ یا دەپچڕێنێ؛ پچڕێنەر (٣) ماوەی پچڕان؛ ووچان؛ پشوو.

**intersect** (in′tẽr-sekt′), *v.t.* کردن بە دوو بەشەوە بە پیاتێپەڕین؛ لێکدان (هێڵ، ڕێ)؛ بڕین *( A line ~s the angle.)*

*v.i.* لەیەکدان (هێڵ، ڕێ)؛ یەکتری بڕین؛ بەیەکگەیشتن:

*( The roads ~ at the railroad.)*

**intersection** (in′tẽr-sek′shən), *n.* (١) یەکتربڕین (ڕێ، هێڵ)؛ لەیەکدان (٢) چوارڕێیان؛ دووڕێیان؛ دووڕیان:

*( There is a traffic light at the ~ . )*

(٣) شوێنی یەکتربڕین یا لێکدانی دوو هێڵ یا دوو ڕوو.

**intersperse** (in′tẽr-spũrs′), *v.t.* (١) پرش‌و بڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە بە ناودا؛ دانان لێرەو لەوێ. (٢) ڕازاندنەوە بە شت هەر لە شوێن نە شوێنێك.

-**interspersion** *(n.).*

**interstate** (in′tẽr-stāt′), *adj.* لەنێوان ولایەت یا لیواکانی وولاتێکی فیدرالیدا: *( ~ commerce, highway, traffic, etc.)* .

**interstellar** (in′tẽr-stel′ẽr), *adj.* نێو ئەستێرەکان

**intertribal** (in′tẽr-trī′bəl), *adj.* نێو تیرەکان یا خێڵەکان.

**intertwine** (in′tẽr-twīn′), *v.t. & v.i.* لەیەك ئاڵاندن؛ لەیەکەوە ئاڵان؛ لەیەك هەڵکێشان؛ لوول خواردن بەیەکەوە؛ تێکەڵاوبوون (مەجازی):

*( The branches ~ . ; The strands of a rope are ~d.)*

-**intertwined** *(adj.)*; **intertwinement** *(n.).*

**intertwist** (in′tẽr-twist′), *v.t. & v.i.* intertwine.

**interval** (in′tẽr-v'l), *n.* (١) دووری یا ماوەی نێوان دوو شت.

(٢) ماوەی نێوان دوو ڕووداو؛ ماوە؛ سەردەم:

*( Trains leave at short ~s.)*

(٣) جیاوازی بەرزی دوو ئاواز

at intervals, (١) ناوبەناو؛ بەین بەین؛ جارنەجار

(٢) لێرەو لەوێ؛ هەر لە شوێن نە شوێنێك.

**intervene** (in′tẽr-vēn′), *v.i.* (١) کەوتنە نێوانەوە (کات)؛ ڕوودان:

*( the years that ~d)*

(٢) (ا) کەوتنە نێوانەوە (بۆ ڕێکخستن)؛ ناوبژی کردن.

*( to ~ in a dispute)*

(ب) دەست خستنەناو کاروباری وولاتێکی تر یا خەڵکەوە؛ دەستدرێژی کردنەسەر وولاتێکی تر:

*( to ~ in a forign country's affairs)*

**intervention** (in′tẽr-ven′shən), *n.* دەست کێشانە ناو (بەتایبەتی کاروباری وولاتێکی تر)؛ دەستدرێژی کردنەسەر؛ دەست خستنەناو

*( military ~ ; to be opposed to armed ~ )*

**interview** (in′tẽr-vū′), *n.* (١) دیدەنی (بۆ گفتوگۆکردن)؛ چاوپێکەوتن:

*( an ~ between an employer and an applicant for a job)*

(٢) دیدەنی یا کۆبوونەوەی ڕووبەڕووی ڕۆژنامەچی‌و کەسێك:

*( to have an ~ with the prime minister)*

(٣) ووتارێکی بڵاوکراوە لە ڕۆژنامە، ڕادیۆ، یا تەلەفزیۆندا دەربارەی ئەم دیدەنی‌یە.

*v.t.* دیدەنی کردن (بۆ گفتوگۆ)؛ ڕووبەڕوو لەگەڵ دووانی کەسێك بۆ دەنگوباس لێوەرگرتنی: *( He has ~ed many politicians.)*

**interweave** (in′tẽr-wēv′), *v.t.* (١) چنین؛ لەیەك هەڵکێشان؛ لەیەکەوە ئاڵاندن (٢) تێکەڵ کردن؛ تێکەڵاوکردن:

*( ~ing truth with fiction)*

**interwoven** (in′tẽr-wō′vən), *adj.* (١) پێکەوە چنراو؛ لەیەکەوە ئاڵاو؛ لەیەك هەڵکێشراو (٢) تێکەڵ کراو؛ تێکەڵاوکراو

**intestate** (in-tes′tāt, in-tes′tit), *adj.* (١) وەسیەتنامەی نەنووسیوە یا بەجێ نەهێشتووە: *( to die ~ )*

(۲) له وه‌سیه‌تنامه‌دا بریار نه‌دراوه بۆ کێ بێت؛ وه‌سیه‌تنامه نایگرێته‌وه:
*( an ~ estate)*
*n.* که‌سێك که ده‌مرێت بێ ئه‌وه‌ی وه‌سیه‌تنامه به‌جێ بهێڵێت
**intestinal** (in-tes'ti-n'l), *adj.* ڕیخۆڵه‌یی؛ هه‌ناوی
**intestinal fortitude,** غیره‌ت؛ ئازایی و کۆڵ نه‌دان؛ زات.
**intestine** (in-tes'tin), *adj.* ناوخۆیی؛ ناوولاتی؛ ناوه‌کی
*n.* ڕیخۆڵه.
**inthrall, inthral** (in-thrôl'), *v.t.* = enthrall.
**inthrone** (in-thrōn'), *v.t.* = enthrone.
**intima** (in'ti-mə), *n.* دیواری ناوه‌وه‌ی بۆری خوێن
**intimacy** (in'tə-mə-si), *n.* (۱) تێکه‌ڵاوی ئه‌ینی دوو که‌س یا زیاتر؛ دۆستایه‌تی؛ تێکه‌ڵی؛ نزیکی
(۲) کرده‌وه‌یه‌ك که نیشانه‌ی دۆستایه‌تی و نزیکی بێ (ماچ، ده‌ستگرتن).
(۳) جووت بوونی دزی
**intimate** (in'tə-mit), *adj.* (۱) ناوه‌کی؛ خۆیی؛ قووڵ:
*( one's ~ feelings, thoughts, etc.)*
(۲) که‌سی؛ په‌نهانی؛ خۆیی؛ هه‌ست‌ونه‌ستی
*( the ~ details of one's life)*
(۳) زۆر نزیك (برادەر، برادەری)؛ گیانی به گیانی
*( an ~ friend; to be on ~ terms with a person)*
(٤) قووڵ؛ وورد؛ باش *( an ~ knowledge of Kurdish literature)*
(٥) ناوکرۆکی؛ ساغه‌بی؛ هه‌ره ناوه‌وه *( the ~ structure of an atom)*
*n.* براده‌رێکی گیانی به گیانی؛ براده‌رێکی زۆر نزیك
*v.t.* (۱) بڵاوکردنه‌وه؛ وتن؛ ده‌ربڕین
(۲) درکاندن؛ وابیشاندان؛ به ناراسته‌وخۆ ده‌ربڕین یا نیشاندان:
*( He ~d his approval of the plan.)*
-intimateness *(n.)*.
**intimately** (in'tə-mit li), *adv.* زۆر له نزیکه‌وه (ناسین)؛ گیانی به گیانی‌یانه؛ زۆر به باشی یا ووردی (زانین):
*( to know a person or subject ~ )*
**intimation** (in'tə-mā'shən), *n.* (۱) بڵاونامه؛ وتن
(۲) درکاندن؛ بیشانه؛ پێشنیاز؛ ئاگا
**intimidate** (in-tim'ə-dāt'), *v.t.* به‌چه‌ترسێن کردن؛ ترساندن (به هه‌ڕه‌شه)؛ ترس تێخه‌رو هه‌ڕه‌شه‌لێکردن.
*( to ~ a witness; to ~ a person into doing something.)*
-intimidator *(n.)*.
**intimidation** (in-timə-dā'shən), *n.* به‌چه‌ترسێن؛ ترس؛ ترساندن به هه‌ڕه‌شه *( to give in or surrender to ~ )*.
**into** (in'too͞, in'too, in'tə), *prep.* (۱) بۆ ناوه‌وه؛ به‌ره‌و ژووره‌وه:
*( to come or walk ~ a building)*
(۲) هه‌تا ناوه‌وه (به‌رده‌وام بوون، کات):
*( They worked far ~ the night.)*
(۳) به (بوون به، گۆڕین به، کردن به، به‌ش کردن به): *( divided ~ parts: to put French ~ English; rain that turned ~ snow)*
**intolerable** (in-tol'ẽr-ə-b'l), *adj.* له‌گه‌ڵی ده‌رنابری؛ له‌گه‌ڵی هه‌ڵ ناکرێ؛ له ڕاده به‌ده‌ر؛ زۆر خراپ *( ~ heat, pain, oppression)*.
-intolerably *(adv.)*.
**intolerance** (in-tol'ẽr-əns), *n.* (۱) چاونه‌پۆشی؛ ته‌نگه‌جیکلانه‌یی؛ هه‌ست خراپ بوون به‌رامبه‌ر و ڕق لێ بوونه‌وه:
*( his ~ of other races and religions)*
(۲) پێ نه‌که‌وتن (خواردن، خواردنه‌وه، ده‌رمان)؛ هه‌ستیاری
*( his ~ of alcohol)*
**intolerant** (in-tol'ẽr-ənt), *adj.* چاونه‌پۆش؛ ته‌نگه‌جیکلانه؛ هه‌ست خراپ به‌رامبه‌ر؛ ڕق لێ بووه‌وه: *( an ~ person)*
**intolerant of,** چاونه‌پۆش؛ ڕق لێ بووه‌وه؛ له‌گه‌ڵ هه‌ڵ نه‌که‌ر
*( He is intolerant of his children's laziness.)*
**intomb** (in-too͞m'), *v.t.* = entomb.
**intonate** (in'tō-nāt'), *v.t.* (۱) خوێندن به ئاوازه‌وه (قورئان).
(۲) به ده‌نگێکی تایبه‌تی وتن
**intonation** (in'tō-nā'shən), *n.* (۱) خوێندن به ئاوازه‌وه (قورئان).
(۲) به‌رزو نزمی ده‌نگ (قسه‌کردن، گۆرانی؛ خوێندنه‌وه).
**intone** (in-tōn'), *v.t.* (۱) خوێندن به ئاوازه‌وه (قورئان)
(۲) به‌رزی و نزمی‌یه‌کی تایبه‌تی دان به ده‌نگ (ووته، گۆرانی).
(۳) به گۆرانی وتن
*v.i.* (۱) خوێندن به ده‌نگی به‌رزو به ئاوازه‌وه. (۲) لووراندن.
**in toto** (in tō'tō), [L.], به هه‌موویی؛ هه‌مووی؛ هه‌مووی پێکه‌وه؛ به ته‌واوی؛ سه‌رجه‌م.
**intoxicant** (in-tok'sə-kənt), *n.* خواردنه‌وه‌ی سه‌رخۆشکه‌ر؛ به‌نگ یا ده‌رمانی هه‌ست سڕکه‌ر یا سه‌رخۆشکه‌ر.
*adj.* سه‌رخۆشکه‌ر؛ مه‌ستکه‌ر
**intoxicate** (in-tok'sə-kāt'), *v.t.* (۱) سه‌رخۆش کردن؛ مه‌ست کردن؛ که‌یل کردن. (۲) شه‌یداکردن؛ هێنانه جۆش؛ شێت‌وشه‌یداکردن.
(۳) ژه‌هراوی کردن (پزیشکه‌وانی)؛ ژه‌هراوی بوون.
**intoxicated** (in-tok'sə-kā'tid), *adj.* (۱) سه‌رخۆش؛ مه‌ست؛ که‌یل. (۲) شێت‌و شه‌یدا؛ شه‌یدا: *( ~ with love)*.
**intoxication** (in-tok'sə-kā'shən), *n.* (۱) سه‌رخۆشی؛ مه‌ستی؛ که‌یلی. (۲) شه‌یدایی؛ شێت‌وشه‌یدایی.
**intra-** (in'trə), پێشگرێکه به‌مانای: له‌ناو؛ له‌ناوه‌وه؛ ناوه‌کی:
*( intramural, intravenous)*
**intractable** (in-trak'tə-b'l), *adj.* (۱) سه‌رکێش؛ که‌لله‌ڕه‌ق؛ دابین ناکرێ؛ سه‌رسه‌خت. (۲) ده‌ستکاری ناکرێ؛ به ئاسانی له قاڵب نادرێ یا شێوه‌ی ناگۆڕێ. (۳) چاره ناکرێ؛ ده‌رمان ناکرێ به ئاسانی؛ که‌م ناکرێته‌وه (ئێش‌وئازار).
**intramural** (in'trə-myoor'əl), *adj.* (۱) له‌ناو سنووری شوێنێکدا (شار، زانکۆ، کۆلیج) (۲) له‌نێوان ئه‌ندامانی قوتابخانه یا زانستگایه‌کدا؛ ناوه‌کی: *( ~ athletics)*.
(۳) له‌ناو دیوار یا بۆشایی ئه‌ندامێکدا (ژیوارناسی).
**intransigence** (in-tran'si-jəns), *n.* *Also* **intransigeance,** سه‌رسه‌ختی و هه‌ڵوێست نه‌گۆڕین؛ ڕێك نه‌که‌وتن؛ مه‌یلی ڕێکه‌وتن نه‌بوون (کاروباری ڕامیاری): *( the ~ of the warring factions)*.
**intransigent** (in-tran'si-jənt), *adj.* سه‌رسه‌خت؛ ڕا نه‌گۆڕ؛ هه‌ڵوێست نه‌گۆڕو ڕێك نه‌که‌وت:
*( an ~ country, party, group, faction, etc.)*
*n.* که‌سێکی سه‌رسه‌خت که ئاماده نه‌بێ ڕای خۆی بگۆڕێ و ڕێك بکه‌وێ (به‌تایبه‌تی له‌کاروباری ڕامیاری و جه‌نگیدا).
**intransitive** (in-tran'sə-tiv), *adj.* تێنه‌په‌ڕ (ڕێزمان)؛ تایبه‌تی به کرداری تێنه‌په‌ڕ، واته که پێویستی به ته‌واوکه‌ر نه‌بێ:
*( I sleep.; He slept.)*
*n.* کردارێکی تێنه‌په‌ڕ (ڕێزمان).
-intransitively *(adv.)*.
**intrant** (in'trənt), *n.* تازه کاربه‌ده‌ست؛ تازه ئه‌ندام (یانه، کۆمه‌ڵه، ده‌سته‌یه‌کی ئاینی... هتد).
**intrastate** (in'trə-stāt'), *adj.* له‌ناو سنووری یه‌ك ویلایه‌ت یا لیوادا (به‌تایبه‌تی له ئه‌مه‌ریکا)
**intravenous** (in'trə-vē'nəs), *adj.* ناو ده‌مار؛ له‌ناو ده‌ماری خوێندا؛ له ده‌ماره‌وه: *( an ~ injection; ~ feeding)*.
-intravenously *(adv.)*.
**intreat** (in-trēt'), *v.t. & v.i.* = entreat.
**intrench** (in-trench'), *v.t. & v.i.* = entrench.
**intrenchment** (in-trench'mənt), *n.* = entrenchment.

**intrepid** (in-trep′id), *adj.* ئازا؛ نەترساو؛ بەزات؛ بەغیرەت.
**intricacy** (in′tri-kə-si), *n.* ووردی؛ ئالۆسکاوی؛ ئالۆزی
**intricate** (in′tri-kit), *adj.* وورد؛ ئالۆز؛ ئالۆسکاو؛ گران؛ تێکەیشتنی گرانە
*( ~ directions; an ~ plot, design, or plan; an ~ machine)*
-intricately *(adv.)*; intricateness *(n.)*.
**intrigue** (in-trēg′), *v.i.* (١) دلداری کردن بە دزییەوە.
(٢) پیلانبازی کردن؛ پیلان گێڕان: *( to ~ against one's friends)*.
*v.t.* (١) فێلبازی کردن؛ فڕوفێڵ کردن؛ بە فڕوفێڵ شتێك بەجێهێنان.
(٢) سەرنج زۆر ڕاکێشان و پێ خۆش بوون: *( The plan ~ed her.)*.
*n.* (١) پیلانسازی کردن؛ پیلان گێڕان
(٢) پیلان پیلانبازی؛ پەنگ؛ فڕوفێل: *( She loves ~s.)*.
(٣) دلدارییەکی دزی
**intrinsic** (in-trin′sik), *adj.* (١) ناوەکی؛ خۆیی؛ هی خۆ؛ ناوخۆیی:
*( the ~ worth of a man; ~ qualities;*
*the oppressive relationships ~ to capitalism)*
(٢) هی ناوەوەی لەش یا ئەندامێکی.
-intrinsical *(adj.)*; intrinsically *(adv.)*.
**intro-** (in′trō), پێشگرێکە بەمانای: بەرەو؛ بەرەو ناوەوە؛ لەناو
**introduce** (in′trə-dōōs′, in′trə-dūs′), *v.t.* (١) جاوساغی کردن؛ بردنە ژوورەوە (٢) پێشکەشی کۆمەڵێك کردن بە ڕەسمی؛ پێناسین.
(٣) تێخستن؛ خستنەناو.
(٤) هێنانە پێشەوە؛ پێشکەش کردن.
*( to ~ a subject into a conversation)*
(٥) هێنانەکایەوە؛ هێنانە ناوەوە (بۆ بەکارهێنان)
*( The war ~d many new words.)*
(٦) پێشکەش کردنی شتێکی تازە بۆ فرۆشتن؛ خستنە بازاڕەوە؛ خستنەڕوو.
(٧) پێناسین؛ پێشکەش کردن؛ بەیەکتر ناسین:
*( I would like to ~ my friend to you.;*
*to ~ two people ; He ~d the speaker to the audience.)*
(٨) (أ) پێشاندن؛ چاوکردنەوە *( They ~d him to city life.)*.
(ب) فێرکردن؛ ڕاهێنان؛ خستنە پێش چاو: *( She ~d him to music.)*.
(٩) پێشکەش کردن بە ڕەسمی بۆ لێکۆڵینەوە (گەلاڵەی یاسا):
*( to ~ a bill to Congress)*
(١٠) دەستپێکردن؛ پێشکەش کردن:
*( He ~d his speech with a joke.)*
**introduction** (in′trə-duk′shən), *n.* (١) پێناسین؛ هێنانەکایەوە؛ پێشکەش کردن (٢) شتێکی پێ ناسراو؛ پێشکەش کراو؛ یا هێنراوەکایەوە.
(٣) (أ) پێشەکی (پەرتووك، ووتار)؛ سەرەتا.
(ب) سەرەتای پارچەیەك مۆسیقا
(٤) پێناسین یا پێشکەش کردن (کەسێك بە کەسێکی تر، کەسێك بە گوێگران یا بە کۆمەڵ)
**introductory** (in′trə-duk′tēr-i), *adj.* سەرەتایی؛ پێشەکی؛ هی پێشەکی *( ~ remarks by the speaker)*.
**introspect** (in′trə-spekt′), *v.t. & v.i.* لە هەست و بیروباوەڕی خۆ کۆڵینەوە؛ لە خۆ کۆڵینەوە؛ بیرکردنەوە لە هەست و نەستی خۆ.
**introspection** (in′trə-spek′shən), *n.* لە هەست و بیروباوەڕی خۆ کۆڵینەوە؛ لە هەست و نەستی خۆ کۆڵینەوە
**introspective** (in′trə-spek′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی هەست و بیروباوەڕی خۆ.
(٢) لە هەست و نەستی خۆ کۆڵەرەوە: *( an ~ person)*.
**introversion** (in′trə-vūr′zhən), *n.* (١) گۆشەگیری؛ ڕوونەکراوەیی؛ سەرنجدان بە بیرو هەستی خۆ نەك بە دەرەوە.
(٢) بۆ ناوەوە چوون؛ چەمانەوە بەرەو ناوەوە
-introversive *(adj.)*.
**introvert** (in′trə-vūrt′), *v.t. & v.i.* (١) گۆشەگیری؛ گۆشەگرتن؛ لە هەست و نەستی خۆ کۆڵینەوە (٢) بەرەو ناوەوە چوون یا نوشتانەوە
*n.* (١) شتێکی چەماوە بەسەر خۆیدا یا بۆ ناوەوە.
(٢) گۆشەگیر؛ کەسێکی گۆشەگیر
*adj.* گۆشەگیر.
-introvertive *(adj.)*.
**intrude** (in-trōōd′), *v.t.* (١) سەپاندن بەسەردا؛ دان بەسەردا
(٢) خۆ سەپاندن بەسەردا؛ خۆ داکوتان؛ دەست کێشانە ناو؛ دەستدرێژی کردنەسەر؛ خۆتێهەڵقورتاندن (٣) بەردی تواوە بەزۆر کردن بەسەر یا بەناو بەردی تردا (زەمیناسی).
*v.i.* خۆ سەپاندن بەسەردا؛ خۆ داکوتان: *( I hope I'm not ~ing.)*.
**intruder** (in-trōō′dēr), *n.* (١) خۆ بەسەردا سەپێنەر؛ خۆ داکوت؛ خۆتێهەڵقورتێنەر (٢) دەستدرێژی کردنەسەر (دز، دوژمن، فڕۆکەی دوژمن)؛ دەست کێشەرە ناو
**intrusion** (in-trōō′zhən), *n.* (١) خۆ بەسەردا سەپاندن؛ خۆداکوتان؛ خۆتێهەڵقورتان (٢) دەست بەسەرداگرتن یا داگیرکردنی زەوی‌وزاری خەڵك؛ چوونە ناو زەوی خەڵکەوە.
(٣) دەستدرێژی کردنەسەر؛ چوونە ناو یا دەست کێشانە ناو وولاتێکی ترەوە
*( an ~ into our country's air space)*
(٤) بەزۆر بەردی تواوە کردنەسەر یا ناو توێی بەردی ترەوە (زەمیناسی)
-intrusive *(adj.)*.
**intrust** (in-trust′), *v.t.* = entrust.
**intubate** (in′tyoo-bāt′, in′too-bāt′), *v.t.* بۆری خستنەناو ئەندامێکی لەشەوە (وەك قوڕگ بۆ هەناسەدان).
-intubation *(n.)*.
**intuit** (in′tū-it, in-tōō′it), *v.t. & v.i.* لەخۆوە زانین؛ بە زگماکی هەستپێکردن یا زانین.
**intuition** (in′tōō-ish′ən, in′tū-ish′ən), *n.* (١) لە خۆوە زانین؛ هۆشی زگماکی؛ بە زگماکی زانین یا هەستپێکردن:
*( to know something by ~ )*
(٢) ڕێ بەدییی؛ سەلیقە
(٣) شتێکی لە خۆوە زانراو یا بە زگماکی هەستپێکراو.
**intuitive** (in-tōō′i-tiv, in-tū′i-tiv), *adj.* (١) لە خۆوە زانراو؛ بە زگماکی زانراو یا هەستپێکراو: *( ~ knowledge)*.
(٢) لە خۆوە زان؛ ڕێ بەدیکەر؛ بە زگماکی زان یا هەستپێکەر:
*( an ~ person; Are women more ~ than men?)*
-intuitiveness *(n.)*.
**intuitively** (in-tōō′i-tiv-li, in-tū′i-tiv-li), *adv.* لەخۆوە (زانین، کردەوە، ڕەووشت)؛ بە زگماکی نەك بە فێربوون
*( to know something ~ )*
**intwine** (in-twīn′), *v.t. & v.i.* = entwine.
**inundate** (in′ən-dāt′, in-un′dāt′), *v.t.* (١) داپۆشین بە ئاو یا بە ئاوی لافاو؛ لافاو لێ هەڵسان؛ نوقوم کردن لە ئاودا
(٢) نوقوم کردن؛ کردن بە ژێرەوە هەر وەك بە لافاو؛ پڕبوون؛ پڕکردن:
*( to ~ with requests; to be ~ed with letters)*
-inundation *(n.)*.
**inure** (in-yoor′), *v.t.* ڕاهێنان (بە شتی ناخۆش):
*( to be ~d to hardships)*
*v.i.* دەستپێکردن یا خستنەکار (یاسا، پەیڕەو):
*( Compensation benefits ~ from the first day of disability.)*
**inutile** (in-ū′t'l), *adj.* بێ سوود؛ بێ کەڵك.
**inutility** (in′yoo-til′ə-ti), *n.* (١) بێ سوودی؛ بێ کەڵکی
(٢) کەسێك یا شتێکی بێ کەڵك.
**invade** (in-vād′), *v.t.* (١) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان؛ داگیرکردن؛ دەستدرێژی کردنەسەر؛ شاڵاو بۆ بردن: *( to ~ another country)*

(۲) تێ وورووژان؛ تێ چڕان؛ تێ وورووکان؛ هێرش بردنە سەر؛
داگیرکردن (مەجاز): *( The children ~d the kitchen.)*
(۳) دەستدرێژی کردنەسەر؛ سنوور شکاندن؛ خۆ سەپاندن بەسەردا:
*( He ~d my privacy.)*
(٤) پیابڵاوبوونەوەو زیان لێدان: *( Disease ~s tissues.)*.
*v.i.* پەلاماردان؛ هێرش بردنە سەر؛ شاڵاو بۆ بردن
**invader** (in-vād′ẽr), *n.* داگیرکەر؛ پەلاماردەر؛ هێرش بەرە سەر؛
دەستدرێژکەر.
**invalid** (in′və-lid), *adj.* (۱) نەخۆش؛ کەفتەکار؛ لاوازو نەخۆش؛
پەککەوتە؛ بێ هێز (۲) هی کەفتەکاران؛ تایبەتی بە نەخۆش و کەفتەکاران:
*( an ~ home)*
*n.* کەسێکی نەخۆش و کەفتەکار؛ کەسێکی پەککەوتەو هەمیشە نەخۆش و
لە جێگادا کەوتوو.
*v.t.* (۱) پەکخستن؛ کەفتەکارکردن؛ لاوازکردن.
(۲) ئازادکردنی سەرباز لەبەر نەخۆشی یا کەفتەکاری.
*v.i.* (۱) پەککەوتن؛ کەفتەکاربوون؛ لاوازبوون.
(۲) خۆلێخستنی سەرباز لەبەر نەخۆشی یا کەفتەکاری
**invalid** (in-val′id), *adj.* نادرووست؛ پووچ؛ بێ بایەخ؛ بەتاڵ بووەتەوە
(باوەڕنامە)؛ کاری پێ ناکرێ؛ نابەجێ:
*( an ~ excuse, argument, claim, passport, etc.)*
**invalidate** (in-val′ə-dāt′), *v.t.* بەتاڵکردنەوە (بڕوانامە، یاسا)؛
نادرووست کردن؛ سڕینەوە (مەجاز)؛ پووچ کردن
**-invalidation** *(n.)*.
**invalidity** (in′və-lid′ə-ti), *n.* نادرووستی؛ بەتاڵی؛ نابەجێیی؛
پووچی.
**invaluable** (in-val′ū-ə-b'l), *adj.* زۆر بەنرخ؛ زۆر بە بایەخ؛
نرخی لەسەر دانانرێ لەبەر زۆر بەنرخی
*( ~ paintings, advice, service, help, etc.)*
**invariable** (in-vâr′i-ə-b'l), *adj.* نەگۆڕ؛ ناگۆڕێ
**invariably** (in-vâr′i-ə-bli), *adv.* هەمیشە؛ هەموو کاتێک؛
بەبێ گۆڕین *( He is ~ late to class.)*
**invariant** (in-vâr′i-ənt), *adj.* نەگۆڕ.
*n.* هێندی نەگۆڕ (بیرکاری)
**invasion** (in-vā′zhən), *n.* (۱) پەلاماردان؛ هێرش بردنە سەر؛
داگیرکردن؛ شاڵاو؛ دەستدرێژی: *( a military ~ )*
(۲) دەستدرێژی (بۆ سەر ماف)؛ سنوور شکاندن؛ هێرش
*( an ~ of privacy)*
**-invasive** *(adj.)*.
**invective** (in-vek′tiv), *adj.* هێرش بەرە سەر (بە دەم)؛ جوێن فرۆش؛
سەرزەنشتکەر؛ دەم پیس؛ بەدگۆ
*n.* (۱) هێرش بردنەسەرێکی توند (بە دەم)؛ بەدگۆیی
(۲) (*pl.*) جوێن؛ ووشەی پیس
**inveigh** (in-vā′), *v.t.* هێرش بردنە سەر بەتوند (بە دەم)
**inveigle** (in-vē′g'l, in-vā′g'l), *v.t.* بەهەڵەبردن؛ بەفریوبردن؛
هەڵفریواندن (بۆ کردنی کاری ناپەسەند)
**invent** (in-vent′), *v.t.* (۱) داهێنان (ئامێر یا شتی تازە)؛
دۆزینەوە (ئامێر): *( Edison ~ed the phonograph.)*.
(۲) هەڵبەستن (درۆ، بەڵگە)؛ درووستکردن:
*( to ~ an excuse, alibi, etc.)*
**inventer** (in-vent′ẽr), *n.* **inventor.**
**invention** (in-ven′shən), *n.* (۱) داهێنان (ئامێرو شتی تازە)
(۲) شتێکی داهێنراو؛ ئامێر (۳) شتێکی هەڵبەستراو؛ درۆ.
**inventive** (in-ven′tiv), *adj.* (۱) تایبەتی بە داهێنان
(۲) داهێنەر؛ زیرەک؛ دۆزەرەوە؛ بەتوانا (داهێنان، هەڵبەستن):
*( He has an ~ mind.)*

**inventor** (in-ven′tẽr), *n.* داهێنەر؛ دۆزەرەوە (ئامێر).
**inventory** (in′vən-tôr′i, in′vən-tō′ri), *n.* بارنامە؛
لیستەی بەسەرکردنەوە.
*v.t.* (۱) لیستەی بەسەرکردنەوە بۆ ئامادەکردن.
(۲) خستنەسەر یا تۆمارکردن لە لیستەی بەسەرکردنەوەدا.
**inverse** (in-vũrs′), *adj.* (۱) هەڵگەڕاوە؛ سەربەرەوخوار هەڵگەڕاوە.
(۲) پێچەوانە؛ بە پێچەوانە.
(۳) بە پێچەوانە (بیرکاری)؛ پەیوەندی بە پێچەوانە:
*( an ~ ratio or proportion)*
*n.* پێچەوانە؛ شتێکی پێچەوانە: *( Love is the ~ of hate.)*.
*v.t.* هەڵگەڕانەوە؛ پێچەوانەکردن؛ وەرگەڕان.
**inversely** (in-vũrs′li), *adv.* بە پێچەوانە؛ بە پێچەوانەی ئەوەوە
**inverse proportion,** پەیوەندی بە پێچەوانە (بیرکاری).
**inverse ratio,** پەیوەندی بە پێچەوانە (بیرکاری).
**inversion** (in-vũr′zhən, in-vũr′shən), *n.* (۱) هەڵگەڕانەوە؛
وەرگەڕان. (۲) شتێکی هەڵگەڕاوە. (۳) وەرگەڕانی دەستووری ڕێکخستنی
ئاسایی ڕستە (ڕێزمان)؛ پاش و پێشخستنی بکەرو کردار:
*( Waiting at the gate was the host.; That I like.)*
(٤) پێچەوانەکردن (بیرکاری). (٥) گۆشەگیری.
(٦) وەرگەڕانی ئاواز.
(۷) هەڵگەڕانەوەی زمان بە پشتدا (دەنگبێژی).
(۸) هەتیوبازی؛ حەز لە توخمی خۆ کردن؛ نێربازی
**invert** (in-vũrt′), *v.t.* (۱) سەربەرەوخوارکردنەوە؛ هەڵگێڕانەوە؛
هەڵگەڕاندنەوە. (۲) وەرگەڕاندن؛ پاش و پێشخستن؛ پێچەوانەکردن.
(۳) نوشتاندنەوە بۆ ناوەوە؛ بەرەو ناوخۆ وەرگەڕاندن.
*n.* (۱) شتێکی هەڵگەڕاوە. (۲) هەتیوباز؛ نێرباز
**invertebrate** (in-vũr′tə-brāt′), *adj.* (۱) بێ بڕبڕە؛ بێ بڕبڕاگە
(۲) ترسنۆک؛ بێ غیرەت؛ ڕاڕا؛ بێ بار.
*n.* گیانداری بێ بڕبڕە یا بڕبڕاگە.
**inverted commas,** [British], = **quotation marks,** وێرگوڵی
سەرەوژێر؛ وێرگوڵی هەڵگەڕاوە
**invest** (in-vest′), *v.t.* (۱) پۆشین؛ جل لەبەرکردن؛ کردنەبەر؛ ڕازاندنەوە
(۲) داپۆشین؛ گرتنەوە: *( Fog ~s the city.)*.
(۳) پڕبوون لە؛ هەڵکێشران لە؛ تێدابوون؛ کرانەبەر (مەجاز):
*( The old ruins were ~ed with romance.)*
(٤) دانان بە فەرمانڕەوا یا کاربەدەستێکی گەورە بە ئاهەنگەوە.
(٥) دەسەڵات پێدان؛ ماف پێدان
*( The military governor has been ~ed with full authority.)*
(٦) وەسوودهێنان؛ پارە هەڵسوڕاندن؛ پارە خستنە ئیش بۆ قازانج؛
بە بەرهەم هێنان: *( to ~ money in real estate)*.
(۷) تێدا خەرج کردن (کات، کۆشش، ووزە، پارە، ڕەنج)؛ ڕەنج تیادان
*( We have ~ed a lot of time and effort in this project.)*
(۸) ئابڵووقەدان؛ دەوردان بە سەرباز.
*v.i.* وەسوودهێنان؛ پارە خستنە ئیشەوە بۆ قازانج؛ پارە هەڵسووڕاندن
**investigate** (in-ves′tə-gāt′), *v.t.* لێکۆڵینەوە بە ووردی؛
لێ ووردبوونەوەو پشکنین و ساغ کردنەوە:
*( to ~ a crime, the causes of a railway accident, etc.)*
**-investigative** *(adj.)*.
**investigation** (in-ves′tə-gā′shən), *n.* لێکۆڵینەوە بە ووردی
(تاوان، ڕووداو).
**investigator** (in-ves′tə-gā′tẽr), *n.* لێکۆڵەرەوە (تاوان، ڕووداو).
**investiture** (in-ves′tə-chẽr), *n.* (۱) لەسەر کار دانان بە ڕەسمی و
بە ئاهەنگەوە؛ دەسەڵات پێدان؛ کردن بە فەرمانڕەوا.
(۲) بەرگ؛ داپۆشەر؛ پۆش؛ سەرەخەر.
**investment** (in-vest′mənt), *n.* (۱) داپۆشین؛ بەرگ لەبەرکردن؛

پۆشین. ٢ کردن بە فەرمانڕەواو دەسەلات پێدان؛ دانان لەسەر کارو مافو دەسەلات پێدان. ٣ (ا) وەسوودهێنانی پارە؛ پارە هەڵسووڕاندن بۆ قازانج.
(ب) پارەی وەسوودهێنراو؛ ئەو پارەیەی دەخرێتە نیشەوە بۆ قازانج:
*( a large ~ )*
(ج) ئەو شتەی پارەی تیا وەسوود دەهێنرێ یا دەخرێتە نیش بۆ قازانج (زەوی‌وزار، خانوو، بازرگانی ... هتد).
(٤) ئابلووقەدان؛ دەورگرتن بە سەرباز

**investor** (in-ves′tẽr), *n.* پارە وەسوودهێنەر؛ پارە هەڵسووڕێنەر بۆ قازانج

**inveterate** (in-vet′ẽr-it), *adj.* (١) دێرین؛ کۆن؛ ڕەگ داکوتاو؛ چەسپاو *( an ~ prejudice)*.
(٢) فێر؛ خوو پێوەگر؛ وازنەهێن؛ بۆ تەرک نەکەر:
*( an ~ smoker, liar, etc.)*

**invidious** (in-vid′i-əs), *adj.* (١) ڕق هەڵسێنەر؛ پیس (کردەوە)
(٢) ناڕەوا؛ نابەجێ؛ ناپەسەند (٣) [Obs.]، چاو لەدوو؛ بەغیل.

**invigilate** (in-vij′ə-lāt′), *v.t.* چاودێری کردنی قوتابیان لەکاتی تاقیکردنەوەدا

**invigorate** (in-vig′ə-rāt′), *v.t.* بەهێزکردن؛ وورەپێدان؛ هێنانە جوش؛ خوێن جووڵاندن؛ بزواندن:
*( an ~ing climate, speech, atmosphere)*

**invincible** (in-vin′sə-b'l), *adj.* نەبەز؛ نابەزێ؛ ناشکێنرێ؛ ناشکێ *( an ~ army, spirit, will, etc.)*
-invincibility *(n.)*.

**inviolable** (in-vī′ə-lə-b'l), *adj.* (١) پیرۆز؛ نابێ بشکێنرێ؛ نابێ دەستکاری بکرێ: *( an ~ oath, promise, law, etc.)*.
(٢) نەبەز؛ نەبڕێنراو؛ بەرهەڵستی هەموو هێرشێك دەکات؛ داگیر ناکرێ؛ ناگیرێ.
-inviolability *(n.)*.

**inviolate** (in-vī′ə-lit, in-vī′ə-lāt′), *adj.* دەست تێوە نەدراو؛ دەستکاری نەکراو؛ پیرۆز؛ دەستدرێژ نەکراوە سەر؛ پاك.

**invisible** (in-viz′ə-b'l), *adj.* (١) نەبینراو؛ شاراوە؛ داپۆشراو؛ نادیار؛ بێ ڕەنگ‌وڕەنگ (٢) بە چاو نابینرێ لەبەر بچووکی.
*n.* شتێك یا بوونەوەرێکی بە چاو نەبینراو
-invisibility *(n.)*.
**the Invisible,** خودا؛ یەزدان
**invisible ink,** مەرەکەبی نەبینراو

**invitation** (in′və-tā′shən), *n.* (١) بانگ کردن بۆ نان خواردن، ئاهەنگ کردنی شتێك؛ بانگ؛ خوێك کردن (دەعوەت).
(٢) هاندان؛ ڕاکێشان.

**invite** (in-vīt′), *v.t.* (١) بانگ کردن بۆ نان خواردن، ئاهەنگ، کردنی کارێك؛ دەنگ کردن:
*( to ~ someone to a party, dinner, etc.)*
(٢) داواکردن؛ تکاکردن *( The speaker ~d questions.)*
(٣) (ا) هێنان بەسەر خۆدا؛ بوون بە هۆ: *( to ~ trouble)*.
(ب) هاندان؛ ڕاکێشان
*n.* [Slang], بانگ کردن؛ بانگ *( to send someone an ~ )*.

**inviting** (in-vīt′iŋ), *adj.* هاندەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ ڕاکێش؛ جوان؛ دڵفڕێن؛ سەرنج ڕاکێش *( an ~ smile)*

**invocation** (in′və-kā′shən), *n.* (١) داواکردن لە خودا بۆ یارمەتی؛ نزا لە خودا؛ پاڕانەوە؛ نزاکردن (٢) نزایەك لە سەرەتای ڕووداوێکی ڕەسمی یا نوێژی ناو کڵێسەدا (٣) نزای بوێژ لە سەرەتای داستان یا هۆنراوەدا بۆ خودای سرووش‌و هونەر بۆ یارمەتیدانی لە نووسینەکەیدا.
(٤) جنۆکەو دێوو درنج بانگ کردن (جادووگەری)

**invoice** (in′vois), *n.* (١) بارنامە
(٢) باری تۆمارکراو لە بارنامەدا؛ بار
*v.t.* تۆمارکردن لە بارنامەدا؛ بارنامە ئامادەکردن



**invoke** (in-vōk′), *v.t.* (١) لە خودا پاڕانەوە؛ نزاکردن؛ داوای یارمەتی کردن لە خودا یا کەسێکی ئاینی پیرۆز.
(٢) جنۆکەو دێوو درنج بانگ کردن (جادووگەری)
(٣) داوالێکردن؛ پاڕانەوە؛ تکاکردن؛ هاوار بۆ بردن.

**involuntary** (in-vol′ən-ter′i), *adj.* (١) خۆ نەویست؛ خۆ نەکرد؛ بەبێ ئارەزووی خۆ: *( an ~ act)*
(٢) بێ دەسەنقەست؛ ڕێکەوت
(٣) لە خۆیەوە ڕوودەدات؛ ئۆتۆماتیکی: *( Digestion is ~ .)*
-involuntarily *(adv.)*.

**involute** (in′və-lōōt, in′və-lūt′), *adj.* (١) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو.
(٢) لوول خواردوو؛ پێچ لوولی؛ پێچ خواردوو (گوێچکەماسی، قاوغ)
(٣) بۆ ناوەوە لوول خواردوو (گەڵا).

**involution** (in′və-loo′shən, in′və-lū′shən), *n.* (١) ئاڵۆسکان؛ تێوە ئاڵۆزان؛ تێوەگلان. (٢) شتێکی ئاڵۆز؛ ئاڵۆزی
(٣) لوول خواردن بۆ ناوەوە؛ ئەندامێکی پێچ لوولی.
(٤) پووکانەوە (تەندرووستی)؛ دانە دواوە.
(٥) ڕستەیەکی ئاڵۆز بەتایبەتی کە بکەرو کردار لەیەك جیاکرابێتەوە بە دەستەواژەیەك (ڕێزمان)
(٦) (ا) چوونەوەیەکی ئەندامێکی لەش‌و گەڕانەوەی بۆ قەبارەی ئاسایی (سکی ئافرەت پاش منداڵبوون) (ب) کزبوونی چالاکی لەش بەتایبەتی کە ئافرەت دەگاتە تەمەنی وەستانی بێ نوێژی یان خوێن پژانی مانگانەی.

**involve** (in-volv′), *v.t.* (١) داپۆشین؛ دەورگرتن؛ پێچانەوە؛ گرتنەوە:
*( Fog ~d the shoreline.)*
(٢) لوول خواردن؛ پێچ خواردن؛ پەپکەخواردن.
(٣) ئاڵۆزان؛ ئاڵۆسکاندن
(٤) تووش کردن؛ تێوەگلاندن؛ تێوەتلان؛ پێوەکردن (سەرئێشە، تاوانباری)
(٥) گرتنەوە؛ تێدابوون؛ ڕاکێشانە ناوخۆ:
*( The procession ~d thousands as it moved toward the Bastille.)*
(٦) پێویست.
(٧) خەریك بوون؛ پێوە خەریك بوون:
*( He is ~d in repairing his house.)*

**involved** (in-volvd′), *adj.* (١) گیروگرفتاوی؛ تێگەیشتنی گرانە؛ ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو؛ وورد (٢) دەستی تێدایەتی (ڕوودان، تاوان)

**involvement** (in-volv′mənt), *n.* (١) تووش کردن؛ تێوەگلان؛ پێوەکردن (٢) پەیوەندی بە کارێك یا ڕووداوێکەوە؛ دەست تێدابوون:
*( His ~ in the crime was never proved.)*
(٣) کاروباری ئاڵۆز

**invulnerable** (in-vul′nẽr-ə-b'l), *adj.* (١) ئازار نادرێ؛ زیانی پێ ناگات؛ کاری تێ ناکرێ؛ هەستی بریندار ناکرێ: *( an ~ person)*
(٢) داگیر ناکرێ؛ ناگیرێ؛ بەرهەڵستی هەموو هێرشێك دەکات:
*( an ~ base, position, etc.)*
-invulnerably *(adv.)*.

**inward** (in′wẽrd), *adj.* (١) ناوەوە؛ هی ناوەوە؛ ناوەکی:
*( the ~ organs of the body)*
(٢) گیانی؛ مێشکی؛ دەروونی (٣) بەرەو ناوەوە چوو
(٤) ناوەوە؛ دوور لە قەراغ (٥) خۆیی؛ زگماکی؛ ناوەکی.
(٦) [Archaic]، خۆماڵی؛ ناوخۆیی.
(٧) [Obs.]، کەسی؛ نهێنی؛ تایبەتی بە خۆ
*n.* (١) بەشی ناوەوە؛ شتی ناوەوە. (٢) *(pl.)*، ڕیخۆڵە
*adv.* (١) بەرەو ناوەوە. (٢) بۆ ناو مێشك، گیان، یا دەروون
(٣) [Obs.]، لە ناوەوە.

**inwardly** (in′wẽrd-li), *adv.* (١) لە ناوەوە (٢) بەرەو ناوەوە.
(٣) لە مێشك‌و دەرووندا؛ لە ناوخۆدا. واتە بێ ئەوەی کەس بیزانێ
*( to be ~ resentful; to grieve ~ )*

**inwardness** (in′wērd-nis), *n.* (١) بیرکردنەوە لە هەست‌ونەست‌و بیری خو (٢) گەوهەر؛ ناوکرۆك؛ ماك. (٣) قووڵی هەست‌و بیر؛ دڵسۆزی.

**inwards** (in-wĕrdz), *adv.* = **inward.**

**inwrap** (in-rap′), *v.t.* **enwrap.**

**inwrought** (in′rôt′, in-rôt′), *adj.* (١) چنراوە بە قوماشەکەوە (نەقش‌ونیگار)؛ پێوە چنراو. (٢) تێکەڵ؛ باش تێکەڵاوکراو.

**iod-, iodo-** (ī-od′), پێشگرێکە بەمانای یۆد.

**iodate** (ī′ə-dāt′), *v.t.* یۆد تێکردن

*n.* یۆدات

**iodin** (ī′ə-din), *n.* = **iodine.**

**iodine** (ī′ə-dīn, ī′ə-din), *n.* یۆد

**iodize** (ī′ə-dīz′), *v.t.* یۆدلێدان؛ بە یۆد برین دەرمان کردن

**ion** (ī′ən, ī′on), *n.* ئایۆن (فیزیا، کیمیا)

**-ionic** *(adj.).*

**-ion,** پاشگرێکە بەمانای: (١) کردارێك یا ئەنجامی کردارێك: ***(indention)***

(٢) باری شتێك ***(cohesion)***

**Ionic** (ī-on′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە ئایۆنیاو گەلەکەی

(٢) هی زمانی ئایۆنی کە بەشێکە لە زمانی یۆنانی

(٣) تایبەتی بە شێوازی خانووسازی ئایۆنی کە بریتی‌یە لە چوکڵەی لوول خواردوو یا پێچ پێچ بە سەری کۆڵەکەوە.

***n.*** (١) جۆرە تیپێکی گەورەی بە ئاسانی خوێنراوەیە (چاپەمەنی).

(٢) زاراوی ئایۆنی کە بەشێکە لە زمانی یۆنانی.

**iota** (ī-ō′tə), *n.* (١) تیپی نۆهەمی ئەلف‌وبێی یۆنانی

(٢) تۆز؛ تەحت؛ تۆزێك؛ ئەختێك

**IOU, I.O.U.** (ī′ō′ū′), من قەرزاری تۆم. بریتی‌یە لە پارچە کاغەزێك کە قەرزار ئەم سێ تیپەی لەسەر دەنووسێ‌و دەیدات بە خاوەن قەرز وەك سەنەدو کورتەی ئەم سێ وشەیەیە: " **I owe you** ".

**IPA,** = **International Phonetic Alphabet,** ئەلف‌وبێی دەنگێنژی جیهانی

**IQ, I.Q.,** = **intelligence quotient.**

**ir-** (ir), پێشگرێکە بەمانای: نە؛ بێ. لەپێش وشەیەکدا بەکاردەهێنرێ کە بە " r " دەست پێ بکات: ***(irresponsible; irreversible)***

**Irak** (ē-räk′, i-rak′), *n.* **Iraq.**

**Iran** (ē-rän′, ī-ran′), *n.* ئێران

**Iranian** (ī-rā′ni-ən), *adj.* تایبەتی بە ئێران‌و گەلەکەی‌و زمانەکەیان‌و کلتوورەکەیان

***n.*** (١) هاوولاتی‌یەکی ئێران؛ فارس

(٢) لقێکە لە زمانی هیندی-ئەورووپی کە فارسی‌و کوردی‌و ئەفغانی، واتە پەشتۆ دەگرێتەوە

**Iraq** (ē-räk′, i-rak′), *n.* عێراق

**Iraqi** (ē-rä′ki), *n.* (١) عێراقی؛ هاوولاتی‌یەکی عێراق

(٢) زمانی عەرەبی عێراقی

***adj.*** عێراقی؛ تایبەتی بە عێراق‌و گەل‌و زمان‌و کلتوورەکەی

**irascible** (i-ras′ə-b′l, ī-ras′ə-b′l), *adj.* تەنگەحیکلانە؛ سەرگەرم؛ تەنگەنیلکە؛ تووڕەوتڕۆ؛ زووهەڵچوو.

**-irascibility** *(n.).*

**irate** (ī′rāt, i-rāt′), *adj.* (١) تووڕە (٢) بە تووڕەیی‌یەوە؛ تووڕەیی‌یانە؛ لە تووڕەیی‌یەوەیە ***(an ~ phone call)***

**ire** (īr), *n.* تووڕەیی؛ ڕق

**ireful** (īr′fəl), *adj.* تووڕە؛ ڕقاوی

**iris** (ī′ris), *n.* (١) پەلکە ڕەنگینە؛ پرچی ئایشێ‌و فاتمە.

(٢) گلێنە؛ گلێنەی چاو؛ ڕەشێنە؛ ڕەشێنەی چاو

(٣) سەوسەن؛ گوڵە سەوسەن.

**Irish** (ī′rish), *adj.* ئێرلەندی؛ تایبەتی بە ئێرلەندەو گەلەکەی‌و زمانەکەی‌و کلتوورەکەی.

***n.*** (١) زمانی ئێرلەندی

(٢) [Colloq.]. تووڕەیی؛ ڕق ***(get one's ~ up)***

**the Irish,** گەلی ئێرلەندە؛ ئێرلەندەیی‌یەکان.

**Irish coffee,** خواردنەوەیەکە لە قاوەو ویسکی‌و کرێم پێکدێت.

**Irishman** (ī′rish-mən), *n.* (١) ئێرلەندی‌یەك؛ پیاوێکی ئێرلەندی؛ هاوولاتی‌یەکی ئێرینەی ئێرلەندی (٢) کەسێکی بنەچە ئێرلەندی

**Irish Republican Army, [ IRA ],** ڕێکخراوێکە خەبات بۆ سەربەخۆیی ئێرلەندە دەکات.

**Irish setter,** سەگێکی تووك درێژی سووری ئاوریشمی‌یە.

**Irish terrier,** سەگێکی بچووکی قژ لوول سوورباوە.

**irk** (ūrk), *v.t.* پەستکردن؛ بێ تاقەت کردن؛ ڕق هەڵسان.

**irksome** (ūrk′səm), *adj.* ناخۆش (ئەرك، چۆنێتی؛ بارێك)؛ بێ تاقەت کەر؛ پەستکەر؛ ورشك (کار): ***(an ~ task; ~ restrictions)***.

**iron** (ī′ērn), *n.* (١) ئاسن (٢) (ا) ئوتوو (ب) ئامێرێکی ئاسن.

(٣) (*pl.*)، پێوەند؛ پێوەندی ئاسن (٤) هێز؛ سەختی.

(٥) [Slang]، چەکێکی ئاگرینی بچووك.

(٦) داری گۆڵف (کە سەرەکەی ئاسنە).

(٧) دەرمانی هێز کە ئاسنی تێدا بێ.

***adj.*** (١) ئاسنین؛ ئاسن؛ ئاسنینە.

(٢) سەخت؛ بەهێز؛ ئاسنین؛ ئانوشتێتەوە: ***(an ~ temperament, will, etc.)***

(٣) بێ بەزەیی؛ دڵڕەقانە؛ بێ ڕەحمانە: ***(to hit with an ~ hand)*** .

***v.t.*** (١) لە ئاسن گرتن؛ بە ئاسن داپۆشین. (٢) پەیوەندکردنی بەندێك

(٣) جل لەئوتوودان؛ ئوتوولێدان.

***v.i.*** جل لەئوتوودان؛ ئوتوولێدان

**have irons in the fire,** خەریك بوون (کاروکاسبی، ڕابواردن، چالاکی).

**in irons,** پەیوەندکراو؛ بەندکراو؛ لە بەندیخانەدا.

**iron out,** ساف کردن؛ لابردن (قۆرت، کۆسپ، ناکۆکی)؛ ناکۆکی بڕینەوە: ***(They held a meeting to iron out their differences.)***

**strike while the iron is hot,** بە گەرماوگەرم کردن؛ کردنی کارێك لە باشترین کاتدا؛ هەڵسان بە کارێك لەکاتی خۆیدا.

**Iron Age,** (١) چەرخی ئاسن: چەرخی بەکارهێنانی ئاسن کە لە سالی هەزاری پێش زاینەوە دەستیپێکرد. (٢) [i-a-]، دوا چەرخ‌و خراپترین چەرخی جیهان (ئەفسانەی کۆن).

**iron-clad** (ī′ērn-klad′), *adj.* (١) لە ئاسن گیراو؛ ئاسن پۆش؛ لە قەڵغانی ئاسن گیراو.

(٢) توندوتیژ؛ سەخت؛ بە زەبروزەنگ: ***(an ~ rule)***

(٣) مسۆگەر؛ تەواو: ***(~ guarantees)*** .

***n.*** کەشتی‌یەکی جەنگی بە قەڵغان دەورگیراو.

**iron curtain,** پەردەی ئاسنین: بەربەستێکە کە بەری پەیوەندی دەگری لەنێوان وولاتاندا بەتایبەتی لەنێوان یەکێتی سۆڤیەت‌و هاوپەیمانەکانی‌و وولاتە ڕۆژئاوایی‌یەکاندا.

**iron hand,** توندوتیژ؛ سەخت؛ بە زەبروزەنگ: ***(to rule a country with an ~ )***

**-iron-handed** *(adj.).*

**iron horse,** [Colloq.], (١) ئەسپە ئاسنینە؛ پاسکیل.

(٢) مەکینەی بزوێن؛ مەکینەی شەمەندەفەر.

**ironic, ironical** (ī-ron′ik, ī-ron′i-k′l), *adj.* (١) بە تەوس؛ لاقرتێی؛ سەیر؛ لاقرتێیی ڕۆژگار یا ژیان؛ پێچەوانە (مەبەست، مانا)؛ تەوس: ***(an ~ remark, event, etc.)*** .

(٢) بە تەوسەوە قسەکەر؛ لاقرتێ باز؛ پڕ لە لاقرتێ.

**-ironically** *(adv.).*

**ironing** (ī′ērn′iŋ), *n.* (١) جل لەئوتوودان.

(٢) ئەو جلەی لەئوتوو دەدرێ.

**ironing board,** مێزی ئوتوودان

**ironist** (ī-ron′ist), *n.* لاقرتێ باز؛ بە تەوسەوە قسەکەر.

**iron-master** (ī′ẽrn-mas´tẽr, ī′ẽrn-mäs´tẽr), *n.* خاوەن کارگەی ئاسن

**iron-monger** (ī′ẽrn-muŋ′gẽr), *n.* ئامێری ئاسن فرۆش؛ ئاسن فرۆش

**iron-side** (ī′ẽrn-sīd´), *n.* پیاوێکی بەجەرگ و ئازا.

**ironsmith** (ī′ẽrn-smith´), *n.* ئاسنگەر

**ironware** (ī′ẽrn-wâr′), *n.* دەفری ئاسن؛ شتومەکی ئاسن.

**ironwork** (ī′ẽrn-wũrk´), *n.* ئامێری ئاسن؛ پارچە ئاسن.

**ironworker** (ī′ẽrn-wũr´kẽr), *n.* (١) ئامێری ئاسن دروستکەر؛ کرێکاری ئاسن (٢) دروستکەری چوارچێوەی پردی ئاسن.

**ironworks** (ī′ẽrn-wũrks´), *n.pl.* کارگەی ئاسن یا تواندنەوەی ئاسن؛ کارگەی ئامێری قورسی ئاسن.

**irony** (ī′rə-ni), *n.* (١) لاقرتێ؛ تەوس

*( The speaker was using ~ when he said that the stupid plan was "very clever.")*

(٢) قسەی بەتەوس؛ قسەی لاقرتێ؛ قسەی بە پێچەوانە.

(٣) لاقرتێی ڕۆژگار، ژیان، یا چارەنووس؛ شتێکی سەیر؛ سەیر؛ ڕووداوێك کە پێچەوانەی ئەوە بێ کە چاوەڕێی دەکرێ:

*( If a poor man inherits a great fortune and dies soon, we might call it one of life's ~ies.)*

(٤) خۆ گێل کردن یا خۆ بە نەزان پیشاندان لە وتووێژو مشتومڕدا. (پێشی دەوترێ: Socratic irony).

**irradiance** (i-rā′di-əns), *n.* شەوقدانەوە؛ ڕووناکی دانەوە؛ شەوق

**irradiant** (i-rā′di-ənt), *adj.* بە شەوق؛ شەوقدار؛ شەوق هاوێژ؛ بریقەدار

**irradiate** (i-rā′di-āt´), *v.t.* (١) شەوقدانەوە؛ ڕووناکی دانەوە؛ بریقەدانەوە. (٢) ڕوونکردنەوە؛ پیشاندان بە ڕوونی.

(٣) دانەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ لێ بوونەوە: *( to ~ joy)*.

(٤) دەرمان کردن بە تیشکی سینی و سەروو وەنەوشەیی... هتد.

*v.i.* (١) شەوقدانەوە؛ تیشکدانەوە. (٢) ڕووناك بوونەوە.

*adj.* بە شەوق؛ شەوقدار

**irradiation** (i-rā´di-ā′shən, ir´rā-di-ā′shən), *n.* (١) شەوق - دانەوە؛ بریقەدانەوە؛ تیشکدانەوە. (٢) تیشك؛ شەوق.

(٣) (ا) ڕوونکردنەوە. (ب) بۆ ڕوون بوونەوە؛ تێگەیشتن.

(٤) دەرمان کردن بە تیشکی سینی و سەروو وەنەوشەیی... هتد.

**irrational** (i-rash′ən-'l), *adj.* (١) بێ مێشك؛ توانای بیرکردنەوەی نییە *( to behave like ~ animals)*.

(٢) نابەجێ؛ لەگەڵ مێشکدا نەگونجاو: *( ~ fears)*.

**irrationalism** (i-rash′ən-'l-iz'm), *n.* بیروبڕوا، بیر، یا کرداری نابەجێ.

**irrationality** (i-rash´ə-nal′ə-ti), *n.* (١) بێ مێشکی

(٢) نابەجێیی.

(٣) بیر یا کردارێکی نابەجێ.

**irreconcilable** (i-rek′ən-sīl´ə-b'l), *adj.* (١) ئاشتیان نابێتەوە؛ پێکەوە هەڵ ناکەن؛ ڕێك ناکەون؛ ئاشت نابنەوە: *( ~ foes)*.

(٢) پێکەوە نەگونجاو؛ دژی یەکتر؛ ناکۆك:

*( ~ ideas, statements, actions, etc.)*

*n.* (١) کەسێکی سەرسەخت؛ کەسێك کە ڕێك ناکەوێت لەسەر هیچ شتێك.

(٢) *(pl.)* بیروباوەڕو کرداری پێکەوە نەگونجاو، ناکۆك، یا دژ بە یەکتر.

**-irreconcilability** *(n.).*

**irrecoverable** (ir´i-kuv′ẽr-ə-b'l), *adj.* دەست ناکەوێت؛ لەکیس چووە؛ نایەتەوە؛ ناهێنرێتەوە؛ چاك ناکرێتەوە: *( ~ losses)*.

**irredeemable** (ir´i-dēm′ə-b'l, ir´ri-dēm′ə-b'l), *adj.* (١)- ناگۆڕرێتەوە بە پارەی وردە (پارەی کاغەز)؛ نرخەکەی دەست ناکەوێتەوە بە پارەی وردە. (٢) ناکڕرێتەوە (شتی بارمتەکراو)؛ دەرناهێنرێتەوە لە بارمتە.

(٣) نادرێتەوە (قەرز)؛ دەست ناکەوێتەوە؛ ناسەنرێتەوە.

(٤) لەدەست چووە؛ لەکیس چووە؛ ناگەڕێنرێتەوە؛ ناگەڕێتەوە: *( ~ losses)*

(٥) چاك نابێ (ڕەووشت، مرۆڤ، ڕەفتار)؛ ناخرێتەوە سەر ڕێی ڕاست؛ دەستی لێ شۆراوە (کەسێکی سەرسەری بێ ڕەووشت)؛ ناگۆڕێ.

**irreducible** (ir´i-dōōs′ə-b'l, ir´ri-dūs′ə-b'l), *adj.* (١) کەم ناکرێتەوە؛ کەمتر ناکرێتەوە (٢) ناگۆڕرێ بۆ بارێکی ویستراو.

**irrefragable** (i-ref′rə-gə-b'l), *adj.* بە درۆ ناخرێتەوە؛ بەرپەرچ نادرێتەوە.

**irrefutable** (i-ref′yoo-tə-b'l, ir′ri-fū′tə-b'l), *adj.* بە درۆ ناخرێتەوە؛ بەرپەرچ نادرێتەوە؛ ڕاست: *( ~ evidence)*.

**-irrefutability** *(n.)*; **irrefutably** *(adv.).*

**irregardless** (ir´i-gärd′lis, ir´ri-gärd′lis), *adj. & adv.* = **regardless.**

**irregular** (i-reg′yoo-lẽr), *adj.* (١) ناوێزە؛ جیا؛ نائاسا

(٢) نارێك وپێك؛ نادەستووری؛ تێکەڵاووپێکەڵاو.

(٣) خواروخێچ؛ نایەکسان؛ لاسەنگ؛ نارێك.

(٤) نارێك وپێك؛ لامسەرلا؛ چۆن ڕێکەوت وەها؛ بە نارێك وپێکی ڕوودەدات:

*( ~ intervals, visits, etc.)*

(٥) نادەستووری (ڕێزمان)؛ بە جیا گەردان دەکرێت (ڕێزمان):

*( <u>Go</u> and <u>write</u> are ~ verbs.)*

*n.* (١) شتێکی نارێك وپێك؛ کەسێکی نارێك وپێك.

(٢) سوپا یا سەربازی نائاسایی.

**irregularity** (i-reg´yoo-lar′ə-ti, ir´reg-yoo-lar′ə-ti), *n.* (١) نارێك وپێکی؛ نارێکی؛ نادەستوورێتی؛ پەیڕەوی یاسا نەکردن

(٢) شتێکی نارێك یا نارێك وپێك.

**irrelative** (i-rel′ə-tiv), *adj.* = **irrelevant.**

**irrelevance** (i-rel′ə-vəns), *n.* (١) پەیوەندی نەبوون بە باسەکەوە؛ لە باس بەدەری؛ ناگرنگی. (٢) شتێکی لە باس بەدەر؛ شتێکی بێ پەیوەندی بە باسەکەوە یا ناگرنگ.

**irrelevancy** (i-rel′ə-vən-si), *n.* = **irrelevance.**

**irrelevant** (i-rel′ə-vənt), *adj.* پەیوەندی بە باسەکەوە نییە؛ بێ پەیوەندی؛ لە باس بەدەر؛ ناگرنگ؛ لە جێی خۆیدا نییە:

*( an ~ issue, remark, question, etc.)*

**irreligious** (ir´i-lij′əs, ir´ri-lij′əs), *adj.* بێ ئاین؛ کافر.

**irremediable** (ir´i-mē′di-ə-b'l), *adj.* بێ چارە؛ بێ دەرمان؛ چاك ناکرێ؛ چاك ناکرێتەوە.

**irremissible** (ir´i-mis′ə-b'l, ir´ri-mis′ə-b'l), *adj.* لێخۆش- بوونی بۆ نییە.

**irremovable** (ir´i-mōōv′ə-b'l), *adj.* ناجووڵێنرێ؛ ناجووڵێ؛ لانابرێ.

**irreparable** (i-rep′ẽr-ə-b'l), *adj.* چاك ناکرێ؛ چاك ناکرێتەوە؛ جێی خۆی ناگرێتەوە: *( an ~ damage)*.

**-irreparably** *(adv.).*

**irrepealable** (ir´i-pēl′ə-b'l, ir´ri-pēl′ə-b'l), *adj.* لانابرێ؛ ناسڕرێتەوە (یاسا)؛ ناگۆڕێ؛ هەڵناوەشێنرێتەوە.

**irreplaceable** (ir´i-plās′ə-b'l), *adj.* هیچ جێگەی ناگرێتەوە (شت، مرۆڤ)؛ جێگەی پڕ ناکرێتەوە:

*( an ~ leader, thing, person, etc.)*

**irrepressible** (ir´i-pres′ə-b'l), *adj.* پێشێل ناکرێ؛ دابین ناکرێ؛ ناگیرێ؛ دەمکوت ناکرێ؛ دانامرکێنرێ؛ جڵەوی ناگیرێ: *( ~ joy)*.

**irreproachable** (ir´i-prōch′ə-b'l), *adj.* بێگەرد؛ بێ سووچ؛

بێ لۆمە؛ لۆمەی ناکرێ؛ لۆمەی لەسەر نییە: *( ~ behavior)* .

**irresistible** (ir´i-zis′tə-b'l), *adj.* بەرهەڵستی ناکرێ؛ بەری ناگیرێ؛ بەربەست ناکرێ؛ بەربەرەکانی ناکرێ؛ زۆر جوان و دڵرفێن:

*( an ~ feeling, smile, beauty, desire, etc.)*

-irresistibility *(n.)*; irresistibly *(adv.)*.

**irresoluble** (i-rez′ə-lyoo-b'l), *adj.* = insoluble.

**irresolute** (i-rez′ə-lōōt´, i-rez′ə-lūt´), *adj.* ڕاڕا؛ دوودڵ

**irresolution** (ir´rez´ə-lū′shən), *n.* ڕاڕایی؛ دوودڵی.

**irresolvable** (ir´i-zol′və-b'l), *adj.* (١) شیناکرێتەوە؛ پارچە پارچە ناکرێت. (٢) چاری نییە (ناکۆکی، کێشە)؛ ناخرێ بە لایەکدا؛ نابڕێتەوە

**irrespective** (ir´i-spek′tiv), *adj.* [Rare]. گوێ پێ نەدەر؛ بێباك

irrespective of, بێ گوێ دان بە؛ لەگەڵ ئەوەشدا؛ بێ ڕەچاوکردن:

*( He rushed forward to help irrespective of the-consequences.)*

**irresponsibility** (ir´i-spon´sə-bil′ə-ti), *n.* (١) بێ لۆمەیی؛ بێ سووچی. (٢) پشت پێ نەبەستران؛ گوێ نەدانە ئەنجامی کاری خۆ؛ بێ هەستی؛ بێباکی.

**irresponsible** (ir´i-spon′sə-b'l), *adj.* (١) لۆمە ناکرێ؛ لۆمەی لەسەر نییە؛ لێی ناپرسرێتەوە *( an ~ child)* .

(٢) پشتی پێ نابەسترێ؛ بێباك؛ گوێ نەدەر؛ ناشرین (کردەوە)؛ بێ هەست؛ نابەجێ *( an ~ person, behavior, act, etc.)*

*n.* کەسێکی پشت پێ نەبەستراو، بێباك، یا گوێ نەدەر

**irresponsibly** (ir´i-spon′sə-bli), *adv.* بە بێباکانە؛ بە ناشرینی؛ بە پشت پێ نەبەستراوانە؛ بە نابەجێیی.

*( He behaved ~ toward his parents.)*

**irresponsive** (ir´i-spon′siv), *adj.* (١) کاری تێ نەکردووە؛ هیچ نەگۆڕاوە یا چاکتر نەبووە: *( The patient is ~ to treatment.)* .

(٢) وەڵام نەدەرەوە؛ بێ مەیل.

**irretrievable** (ir´i-trēv′ə-b'l), *adj.* دەست ناکەوێتەوە؛ ناگەڕێنرێتەوە؛ ناهێنرێتەوە؛ لەدەست چوو: *( an ~ loss)* .

**irreverence** (i-rev′ēr-əns), *n.* (١) ڕێز نەگرتن. (٢) کارێك یا کردەوەیەك کە ڕێز نەگرتن پیشان دەدات. (٣) ڕێز لێ نەگیران.

**irreverent** (i-rev′ēr-ənt), *adj.* ڕێز نەگر؛ ڕێز لێ نەگر؛ بە چاوی سووك تەماشاکەر. *( an ~ person, act, behavior, etc.)* .

**irreversible** (ir´i-vūr′sə-b'l), *adj.* (١) هەڵناوەشێنرێتەوە (بڕیار)؛ ناسڕێتەوە (یاسا)؛ ناگۆڕێ *( an ~ decision)*

(٢) پاش و پێش ناخرێ؛ هەڵناگێڕێتەوە؛ ناگێڕێتەوە بۆ دواوە.

-irreversibility *(n.)*; irreversibly *(adv.)*.

**irrevocable** (i-rev′ə-kə-b'l), *adj.* هەڵناوەشێنرێتەوە (بڕیار، یاسا)؛ ناگۆڕێ؛ ناسڕێتەوە؛ لانابرێ؛ هەتا هەتا هەڵوەشانەوەی بۆ نییە:

*( an ~ decision, judgment, act, etc.)*

**irrevocably** (i-rev′ə-kə-bli), *adv.* بەشێوەیەك کە هەڵناوەشێتەوە یا نەگۆڕێ؛ هەتا هەتا: *( They are ~ separated, tied together, etc.)* .

**irrigable** (ir′i-gə-b'l), *adj.* بەراو؛ ئاو دەدرێ (زەوی‌وزار)؛ ئاوەنیا.

**irrigate** (ir′ə-gāt´), *v.t.* (١) ئاودان (زەوی‌وزار، ڕووەك)؛ ئاودێری کردن. (٢) شۆردن یا پاککردنەوە (پزیشکەوانی).

-irrigator *(n.)*.

**irrigation** (ir´ə-gā′shən), *n.* ئاودان (زەوی‌وزار، ڕووەك)؛ ئاودێری

-irrigational *(adj.)*.

**irritability** (ir´ə-tə-bil′ə-ti), *n.* (١) تەنگەجیکلانەیی؛ بێ تاقەتی؛ تەنگەتیلکەیی؛ زوو شێتگیربوون (٢) ناسکی (ئەندامی لەش).

**irritable** (ir′ə-tə-b'l), *adj.* (١) تەنگەجیکلانە؛ تەنگەتیلکە؛ زوو تووڕەبوو؛ زوو شێتگیربوو. (٢) ناسك (ئەندامی لەش):

*( an ~ stomach)*

-irritably *(adv.)*.

**irritant** (ir′ə-tənt), *adj.* پەستکەر؛ تووڕەکەر؛ ناخۆش (شت).

*n.* (١) شتێکی چووزێنەرەوە یا ناڕەحەتکەر (ئاڵەت، تەپ‌وتۆز).

(٢) شتێکی پەستکەر؛ شتێك یا کەسێکی دڵ پەستکەر یا سەرئێشێن.

**irritate** (ir′ə-tāt´), *v.t.* (١) پەستکردن؛ تووڕەکردن؛ بێ تاقەت کردن؛ بێزارکردن؛ سەرئێشاندن. (٢) داگیرساندن (پزیشکەوانی)؛ هەوپێکردن؛ ئازاردان؛ سوورکردنەوە؛ چووزاندنەوە؛ ئێشاندن:

*( Harsh soap ~s the skin.; The heavy smoke ~ed my eyes.)*

**irritation** (ir´ə-tā′shən), *n.* (١) پەستکردن؛ تووڕەکردن؛ دڵگرتن. (٢) پەستی؛ دڵگیران؛ تووڕەبوون (٣) شتێکی پەستکەر، تووڕەکەر، یا دڵگر (٤) ئازارگەیشتن؛ داگیرسان (ئەندامی لەش)؛ سووربوونەوە یا هەوکردن:

*( stomach, skin, or eye ~ )*

**irrupt** (i-rupt′), *v.i.* (١) سنوور شکاندن؛ پەلاماردان؛ شاڵاو بردنە سەر؛ هێرش بردنە سەر. (٢) زیادبوونی ناڕێك‌وپێك (دانیشتوان).

-irruption *(n.)*; irruptive *(adj.)*.

**is** (iz), باری کرداری "بوون"، بۆ کەسی سێهەمی تاکی نادیار:

*( She ~ ready.; The book ~ not there.; It ~ ten o'clock.; He ~ doing his homework.)*

as is, ئێستا چۆنە هەر وەها؛ بەبێ گۆڕین؛ چۆنە وەها.

**is-** (is), = **iso-**.

**-ish** (ish), پاشگرێکە بەمانای: (١) — ی (ئیسپانی، کوردی، ئیرلەندی):

*( Spanish, Kurdish, Irish)*

(٢) — ئانە (منداڵانە): *( childish, devilish)* .

(٣) مەیل یا خەریکی ئەو شتە بوو: *( bookish)* .

(٤) — باو (سوورباو)؛ ئەختێ: *( tallish, reddish, bluish)* .

(٥) [Colloq.]، نزیکەی (ژمارە): *( thirtyish)* .

**Isis** (ī′sis), *n.* خودای پیت (ئەفسانەی میسری).

**Islam** (is′ləm, is-läm′, iz′ləm), *n.* (١) ئیسلام؛ ئاینی ئیسلام. (٢) موسوڵمانان. (٣) وڵاتە ئیسلامی‌یەکان.

**Islamic**(is-lam′ik, is-läm′ik, iz-lam′ik), *adj.* ئیسلامی.

**Islamite** (is′ləm-īt´, iz′ləm-īt´), *n.* موسوڵمانێك؛ موسوڵمان.

**island** (ī′lənd), *n.* (١) دوورگە؛ (جزیرە). (٢) دوو بەینی (ڕێگاوبان، شەقام)؛ تیلماسکە زەوی‌یەکە لەنێوان ڕێگاوبان یا شەقامی دووسەریدا کە ئۆتۆمبیلی پیا ناڕوات بۆ جیاکردنەوەی ڕێگەکە و سەلامەتی

*v.t.* (١) کردن بە دوورگە؛ وەك دوورگە لێکردن؛ جیاکردنەوە؛ دابڕکردن. (٢) پچڕپچڕکردن.

**islander** (ī′lən-dēr), *n.* دوورگەنشین؛ نیشتەجێی دوورگە.

**isle** (īl), *n.* دوورگەیەکی بچووك: *( the British I~s)* .

*v.t.* جیاکردنەوە؛ دابڕکردن.

*v.i.* لە دوورگەدا ژیان یا نیشتەجێ بوون.

**islet** (ī′lit), *n.* دوورگەیەکی زۆر بچووك.

**ism** (iz'm), *n.* تیۆری، فەلسەفە، یا ڕێبازێکە کە ناوەکەی بە " ism " دوایی دێت (لە ڕووی سووکی‌یەوە).

**-ism** (iz'm), پاشگرێکە بەمانای: (١) کردنی کارێك یا ئەنجامەکەی: *( terrorism)*

(٢) باری "بوون": *( barbarism)* .

(٣) ڕەفتار و کردەوەی تایبەخۆ: *( patriotism)* .

(٤) ڕێباز؛ تیۆری؛ فەلسەفە. *( socialism)* .

(٥) دڵسۆزی بۆ: *( nationalism)* .

(٦) بارێکی نائاسایی: *( alcoholism)* .

**isn't** (iz′'nt), = is not.

**iso-** (ī′sō, ī′sə), پێشگرێکە بەمانای: وەك یەك؛ هاو؛ کوت‌ومت؛ یەکسان.

**isobar** (ī′sə-bär´), *n.* (١) هێڵێکە کە لەسەر نەخشە دەکێشرێت لەنێوان

ناوچەی هاوپەستاوتنی هەوا لە ماوەیەکی تایبەتیدا.

(۲) ئەتۆمی هاوکێشەی ئەتۆمی و ژمارەی ئەتۆمی جیاواز.

**isocracy** (ī-sok′rə-si), *n.* پژێمی یەکسانی (لەرووی دەسەڵاتی ڕامیاریەوە)؛

**isodiametric** (ī′sə-dī′ə-met′rik), *adj.* هاوتیرە

**isodynamic** (ī′sō-dī-nam′ik), *adj.* (۱) هاوهێز

(۲) هاوهێزی موگناتیسی.

**isoelectric** (ī′sō-i-lek′trik), *adj.* هاوهێزی ئەلەکتریکی.

**isogenous** (ī-soj′ə-nəs), *adj.* هاوسەرچاوە

**isolate** (ī′sə-lāt′, is′ə-lāt′), *v.t.* (۱) جیاکردنەوە؛ دابڕکردن؛ دابڕین؛ تەریک کردن؛ پەرکردن. (۲) گەورەکردن یا بەخێوکردنی نموونەیەکی بەکتریایی بە تەنها. (۳) قوزەنتین کردنی نەخۆش؛ جیاکردنەوەی نەخۆش.

**isolation** (ī′sə-lā′shən, is′ə-lā′shən), *n.* (۱) دوورەپەرێزی؛ تەریک گری؛ بڕبوون؛ دابڕبوون؛ گۆشەگیری؛ خۆ دوور گرتن؛ تەنهایی؛ تەریکی؛ خەلوەت؛ پەربوون؛ بێ پەیوەندیتی: *( to live in ~ )*.

(۲) قوزەنتین کردن؛ جیاکردنەوەی نەخۆش:

*( an ~ hospital, ward, etc.)*

**isolated** (ī′sə-lā′tid, is′ə-lā′tid), *adj.* چەپە حێگا؛ لاتەریک؛ دوورەپەرێز؛ دوور؛ پەر؛ بێ پەیوەندی.

**isolationism** (ī′sə-lā′shən-iz′m), *n.* گۆشەگیری ڕامیاری و بازرگانی وڵاتێك

**isolationist** (ī′sə-lā′shən-ist), *n.* پاڵپشتکەری گۆشەگیری ڕامیاری و بازرگانی وڵاتەکەی؛ گۆشەگیر؛ گۆشەگیرخواز؛ کەنارگر.

**isometric** (ī′sə-met′rik), *adj.* هاوپێوانە؛ هاوکێشە

**isometry** (ī-som′ə-tri), *n.* (۱) هاو ئەوەندەی یەکی؛ هاوپێوانی

(۲) هاوبەرزی (لە ئاستی دەریاوە).

**-ison** (ə-s′n), پاشگرێکە ناوی لێ درووست دەکرێ: *( comparison)* .

**isonomy** (ī-son′ə-mi), *n.* یەکسانی (ماف)

**isosceles** (ī-sos′ə-lēz′), *adj.* سێگۆشەی جووت لا؛ سێگۆشەی دوو لا یەکسان: *( ~ triangle)* .

**isostasy** (ī-sos′tə-si), *n.* هاوتایی زەمین (زەمینناسی)

**-isostatic** *(adj.)*.

**Israeli** (iz-rā′li), *adj.* ئیسرائیلی؛ جوولەکە؛ یەهوودی.

**Israelite** (iz′ri-əl-īt′), *n.* جوولەکە؛ عیبرانی؛ یەهوودی؛ ئیسرائیلی.

**issuable** (ish′ōō-ə-b′l, ish′ū-ə-b′l), *adj.* (۱) دەردەکرێت (چاپەمەنی)؛ بۆی هەیە دەربکرێت یا بلاوبکرێتەوە.

(۲) لێی دەکۆڵرێتەوە لە دادگادا.

**issuance** (ish′ōō-əns, ish′ū-əns), *n.* دەرکردن (چاپەمەنی، پاسا، پەیرەو).

**issue** (ish′ōō, ish′ū), *n.* (۱) چوونە دەرێ؛ دەرچوون.

(۲) دەرگا؛ کون؛ ڕێ. (۳) ئەنجام؛ بەرهەم.

(٤) وەچە؛ نەوە؛ منداڵ؛ بەچە.

(٥) قازانج؛ دەسکەوت.

(٦) مەسەلە؛ باس؛ مەسەلەیەکە کە ناکۆکی لەسەرە؛ کێشە:

*( to debate an ~ )*

(٧) دەرکردن (ڕۆژنامە، گۆڤار، بروانامەی دارایی، پەیرەو، پاسا).

(٨) (أ) بلاوکراوە (ڕۆژنامە، گۆڤار، بروانامەی دارایی): *( an ~ of bonds)* .

(ب) ژمارەی ڕۆژنامە یا گۆڤار:

*( the most recent ~ of a magazine, journal, newspaper)*

(٩) (أ) خوێن یا کێم لێ هاتن؛ خوێن پژان.

(ب) کون تێکردنی دوومەڵێك بۆ کێم دەرکردن.

*v.i.* (۱) هاتنەدەرەوە؛ لێ هاتنەدەرەوە؛ لێ هاتن؛ لێ ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتن:

*( blood ~ing from the wound)*

(۲) لێوەهاتن (باووباپیر)؛ نەوە یا وەچەی فلانە کەس یا تیرە بوون.

(۳) ئەنجامی ئەوە بوون؛ لەوەوە هاتن؛ بوون بە هۆ؛ لێوە پەیدابوون.

(٤) دەسکەوتن؛ هاتنەدەست.

(٥) دەرکران (ڕۆژنامە، گۆڤار)؛ بلاوکرانەوە؛ دەرچوون.

*v.t.* (۱) دەردان؛ لێ هاتن؛ لێ ڕۆیشتن؛ لێ هاتنەدەرەوە؛ فرێدان.

(۲) دابەشکردن؛ پێدان: *( to ~ supplies to the soldiers)*

(۳) دەرکردن (ڕۆژنامە، گۆڤار، پەیرەو، بروانامەی دارایی)؛ بلاوکردنەوە

*( to ~ a newspaper, a magazine, a new stamp, government bonds, a decree, etc.)*

**at issue,** ئەو باسەی لێی دەکۆڵرێتەوە؛ ئەو مەسەلەیەی ناکۆکی لەسەرەو دەبێ باس بکرێ و بخرێ بە لایەکدا:

*( At issue is whether we are for freedom or not.)*

**join issue,** (۱) کەوتنە ناکۆکی یا مشتومڕەوە لەگەڵ یەکتردا.

(۲) مەسەلەیەك پێکەوە خستنە بەردەمی دادگا بۆ بڕیار لەسەردان.

**take issue,** ڕێك نەکەوتن لەگەڵ؛ ڕا لەسەر نەبوون؛ ناکۆکی لەگەڵدا بوون:

*( I take issue with what you just said.)*

**isthmus** (is′məs), *n.* پارچە زەوییەکی تەسکە هەردوو لای ئاو یا دەریایە دوو شوێنی وشکانی بەیەك دەگەیێنێ؛ تەنگە زەوی:

*( the I~ of Panama)*

**-istic** (is′tik), پاشگرێکە بەمانای: تایبەتی بە؛ ناسراوە بە:

*( artistic, altruistic)*

**it** (it), *pron.* (۱) ئەو (بۆ شتی بێ گیان، گیاندار، یا منداڵ):

*( I~ is playing in the yard.; I~ is four months old.; who is ~? I~ is mine.)*

(۲) بکەری کرداری گشتی: *( I~ is cold.; I~ is raining.)*

(۳) تەواوکەری نادیار:

*( Carry ~ off successfully.; Confound ~ !; Face ~ out.)*

**Italian** (i-tal′yən), *adj.* ئیتاڵی؛ هی گەل و زمان و کلتووری ئیتالیا.

*n.* (۱) ئیتاڵی؛ هاووڵاتییەکی ئیتالیا (۲) زمانی ئیتاڵی.

**italic** (i-tal′ik), *adj. & n.* چاپی خوار؛ تیپی لار:

*( This is ~ type.)*

**italicize** (i-tal′ə-sīz′), *v.t.* بە تیپی خوار چاپ کردن (بۆ سەرنج ڕاکێشان).

**Italy** (it′′l-i), *n.* ئیتالیا.

**itch** (ich), *v.i.* (۱) هاتنە ئاڵۆش؛ هاتنە خورو؛ خوران.

(۲) کەوتنەسەر کەڵکەڵە؛ زۆر حەزکردن.

*n.* (۱) ئاڵۆش؛ خورو؛ خوران؛ خورۆش.

(۲) کەڵکەڵە؛ حەزێکی زۆر *( to have an ~ to travel)* .

**itchy** (ich′i), *adj.* ئاڵۆشاوی؛ بە ئاڵۆش؛ خورواوی؛ بە خورۆش؛ بە خورو: *( an ~ skin)*

**-itchiness** *(n.)*.

**-ite** (īt), پاشگرێکە بەمانای: (۱) نیشتەنی؛ نیشتەجێ؛ دانیشتوو؛ هاووڵاتی: *( Brooklynite)* .

(۲) شوێن کەوتووی بیروباوەڕێك؛ خواز؛ پاڵپشتیکەر: *( Hashemite)* .

(۳) شتێکی درووستکراو: *( dynamite)*

(٤) شتێکی بەردین.

(٥) بەشی ئەندامێکی لەش. (٦) خوێ (کیمیا): *( nitrite)* .

**item** (ī′təm), *n.* (۱) دانە؛ بەند؛ شت؛ ماددە:

*( an ~ in a catalog; the first ~ on a program)*

(۲) دەنگوباس:

*( Are there any interesting ~s in today's newspaper?)*

*v.t.* نووسین لە لیستەدا؛ تۆمارکردن لە لیستەیەکدا.

**itemize** (ī′təm-īz′), *v.t.* لیستەگرتن؛ تۆمارکردن لە لیستەیەکدا؛ نووسین دانە بە دانە: *( to ~ a bill; an ~d list, account)* .

**iterate** (it′ə-rāt′), *v.t.* دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە.

**-iteration** *(n.)*.

**itineracy** (i-tin′ēr-ə-si, i-tin′ēr-ə-si), *n.* = itinerancy.

**itinerancy** (ī-tin′ĕr-ən-si, i-tin′ĕr-ən-si), *n.* (١) گەڕۆکی:
هاتوچۆ کردن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک بە فرمان.
(٢) دەستەیەک مەلا یا دادپرسی گەڕۆک.
(٣) فرمانێک کە پێویست بە هاتوچۆ کردن بکات لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک.
**itinerant** (i-tin′ĕr-ənt, i-tin′ĕr-ənt), *adj.* گەڕۆک
*( ~ musician, farm workers, etc.)*
*n.* گەڕۆکێک؛ گەڕۆک
**itinerary** (ī-tin′ə-rer′i, i-tin′ə-rer′i), *n.* (١) ڕێگەی گەشت:
ڕێ؛ ڕێگا (٢) یادداشتی گەشتیار (٣) ڕابەرنامە
(٤) بەرنامەی گەشت؛ نەخشەی گەشت.
**itinerate** (ī-tin′ə-rāt′, i-tin′ə-rāt′), *v.t.* گەڕان (بەتایبەتی بۆ
مەبەستی ئاین بڵاوکردنەوە یا دادپرسی).
**-itious** (ish′əs), پاشگرێکە بەمانای: - دار؛ هی؛ تایبەتی بە:
*( nutritious, seditious)*
**-itis** (ī′tis), پاشگرێکە بەمانای: نەخۆش یا نەخۆشی بەتایبەتی هەوکردن
یا داگیرسانی ئەندامێکی لەش:
*( bronchitis, appendicitis, tonsillitis)*
**it'll** (it′'l), = it will; it shall.
**its** (its), *pron.* ڕاناوی بوونە بەمانای: - ی؛ هی ئەو:
*( The dog wagged ~ tail.; The horse broke ~ leg.)*
**it's** (its), = it is; it has.
**itself** (it-self′), *pron.* (١) خۆی (بۆ گیاندارو بێ گیانو ڕووەک):
*( The dog scratched ~ . )*
(٢) خۆی لە خۆیدا؛ هەر خۆی (بۆ دووپاتکردنەوە):
*( The house ~ is not worth much but the land is valuable.)*
(٣) بە تەنها؛ هەر خۆی: *( The house stands all by ~ )* .
**-ity** (ə-ti, i-ti), پاشگرێکە بەمانای: بار؛ دۆخ:
*( adversity, chastity)*
**I've** (īv), = I have.
**-ive** (iv), پاشگرێکە بەمانای (١) هی؛ تایبەتی بە: *( native)* .
(٢) بکەر؛ حەزلێکەر؛ خواز *( destructive, creative)* .
**ivied** (ī′vid), *adj.* بە لاولاو داپۆشراو؛ لاولاوی
**ivory** (ī′vĕr-i), *n.* (١) ماهی؛ سەدەف. (٢) ددانی فیل. (٣) ددان.
(٤) ڕەنگی سەدەف؛ سپی (٥) *(pl.)* شتی لە سەدەف درووستکراو؛
شتی ماهی (أ) کلیلی پیانۆ (ب) ددان (ج) زار (تاوڵە، دۆمینە).
(د) تۆپی بلیارد
*adj.* (١) لە سەدەف یا ماهی درووستکراو. (٢) سپی؛ سپی کاڵ.
**ivory tower,** شوێن یا هەڵوێستی گۆشەگیریو خۆ دوور گرتن لە ژیانو
هەر خەریکی بیرکردنەوە بوون (هەندێ جار لەڕووی سووکیو ڕەخنەو
گاڵتەپێکردنەوە بەکاردەهێنرێت).
**ivy** (ī′vi), *n.* لاولاو
**Ivy League,** کۆمەڵەی هەشت زانکۆی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکایە بۆ وەرزشو
چالاکی ناوخۆ (وتەکە هەڵوێستو مۆدەو بیروڕای قوتابیانی ئەم زانکۆیانە
دەردەبڕێت)
**-ization** (ə-zā′shən, ī-zā′shən), پاشگرێکە ناو لە کردارەوە
پێکدێنێ بەمانای: باری شتێک؛ بوونی شتێک:
*( realization; sterilization)*
**-ize** (īz), پاشگرێکە کرداری لێ پێکدێت بەمانای:
(١) کردن بە؛ والێکردن: *( democratize, Americanize, sterilize)* .
(٢) بوون بە؛ والێهاتن: *( crystalize)* .
(٣) خستنەبەر؛ کەوتنەبەر: *( oxidize)* .
(٤) کردنی شتێک؛ هەڵسان بە کردارێک: *( theorize, soliloquize)* .

# J j

**J, j** (jā), *n.* (١) تیپی دەهەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە. (٣) نیشانەی پلەی دەهەم لە لیستەیەکدا.
(٤) شتێك کە شێوەی وەك ئەم تیپە وابێت.

**jab** (jab), *v.t. & v.i.* (١) تێوەژەندن؛ پیاکردن، یا لێدان بە شتێکی تیژ.
(٢) مستەکوڵە لێدان خێرا خێرا.
*n.* (١) تێوەژەندن. (٢) مستەکوڵە.

**jabber** (jab′ēr), *v.t. & v.i.* چەنەدان؛ چەنەبازی کردن؛
قسەی هیچ‌وپووچ کردن.
*n.* چەنەبازی؛ هەڵەوەڕی؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا.

**jack** (jak), *n.* (١) [J-]. شاگرد. (٢) [J-]، کابرا؛ کوڕ؛ پیاو.
(٣) [J-]. کەشتیەوان. (٤) دارفرۆش؛ دارکەر
(٥) [J-]. هەمەکارە؛ کەسێك کە ووردە شارەزاییەکی هەبێت لە گەلێك کاردا.
(٦) شتێکە چەکمەی لە پێ پێ دادەکەنرێ.
(٧) ئامێری هەڵگەڕاندنەوەی شیشی گۆشت برژاندن.
(٨) جەك (ئوتومبیل بەرزکردنەوە)؛ ئامێرێکی شت بەرزکردنەوە.
(٩) قاژ؛ قەلەباچکە. (١٠) نێرەکەر. (١١) نێرە کەروێشك.
(١٢) نێرە ماسی "سالمۆن" (١٣) [Slang]، پارە؛ پۆلیس؛ پۆلیسی نهێنی.
(١٤) کاغەزی "جاك"ی قومار. (١٥) چرای شەوڕاو. (١٦) بەیداخی کەشتی.
(١٧) سویچی ئەلەکتریك.
*v.t.* (١) بەرزکەرەوە بە جەك. (٢) ڕاوکردن یا بۆ گەڕان بە چرا.
*adj.* نێرینەی هەندێ گیاندار.
**every man jack,** هەموو کەس
**jack up,** (١) بەرزکردنەوە بە جەك.
(٢) [Colloq.]. بەرزکردنەوە (نرخ، مووچە، کرێ):
***( to jack up food prices)***
(٣) [Colloq.]. سەرزەنشت کردن؛ لۆمەکردن؛ تەمێ کردن بۆ کارکردن.

**jack-** (jak), پێشگرێکە بەمانای (١) نێرینە: ***( jackass, jackdaw)***.
(٢) گەورە؛ بەهێز ***( jackboot, jackknife)***.
(٣) کوڕ؛ کابرا ***( jack-in-the box)***.

**jackal** (jak′ôl, jak′əl), *n.* (١) چەقەڵ (٢) دەسکەلا؛ داردەست؛
بەردەست؛ نۆکەر؛ کلك (٣) دەستبڕ؛ ساختەچی.

**jackass** (jak′as′), *n.* (١) نێرەکەر. (٢) کەسێکی کەرو بێ مێشك.

**jackboot** (jak′bōōt′), *n.* (١) چەکمە؛ جزمەی درێژ کە دەگاتە ژوور
ئەژنۆ (٢) نیشانەی زەبروزەنگ یا زۆرداری.

**jackdaw** (jak′dô′), *n.* قاژ؛ قەلەباچکە

**jacket** (jak′it), *n.* (١) چاکەت. (٢) بەرگی دەرەوەی پەڕتووك کە لە بەرگە
ڕەقەکە گیراوە. (٣) قاوغی فیشەك. (٤) توێکڵی فاسۆلیاو پاقلە.
(٥) (ا) بەرگی قەوان. (ب) بەرگی بروانامە یا فایلێك.
(٦) هەر بەرگێك کە شتێکی تێوە بپێچرێت.
*v.t.* (١) چاکەت لەبەرکردن. (٢) پێچانەوە.

**jackhammer** (jak′ham′ēr), *n.* ئامێرێکی بە دەستەوە گیراوی
بەرد کونکەرە.

**jack-in-the-box** (jak′in-*thə*-boks′), *n.* بووکەشووشەیەکە
قومقومەیەکی تێدایە.

**jackknife** (jak′nīf′), *n.* (١) قەڵەمبڕی گەورە.
(٢) جۆرە خۆفڕێدانێکە ناو گۆمی مەلەوە کە مەلەوانەکە بە نووشتاوەیی خۆی
فڕێ دەداتە ئاوەکەوەو لاقی ڕاست دەکاتەوە پێش گەیشتنە ئاوەکە بە سەردا
*v.t.* چەقۆ لێدان.
*v.i.* نووشتانەوە لە ناوەڕاستدا (مەلەکردن، لۆری وەرگەڕاو بە لادا).

**jack-of-all-trades** (jak′əv-ôl′trādz′), *n.* کەسێك کە ووردە
شارەزاییەکی هەیە لە هەموو شتێکدا؛ هەمەکارە.

**jack-o'-lantern** (jak′ə-lan′tērn), *n.* (١) ڕووناکییەکە لەسەر
زەلکاو دەبینرێ بە شەو. (٢) کوولەکەیەکی بۆش کراوە توێکڵەکەی شێوەی
دەم‌وچاوێکی لێ هەڵدەکەنرێ‌و مۆمێکی دەخرێتە ناوەوە (بە بۆنەی شەوی
شەوی بەراتەوە).

**jackpot** (jak′pot′), *n.* (١) بلیت یا پاداشتی هەرە گەورەی پیانقۆ یا
هایبەختێك. (٢) [Colloq.]، پاداشت یا دەسکەوتی هەرە بەنرخ و باش
**hit the jackpot,** [Slang], (١) بلیتی هەرە بەنرخ بۆ دەرچوون لە پیانقۆ
یا هایبەختێکدا. (٢) دەسکەوتنی پاداشتی هەرە بەنرخ و گەورە.

**jack rabbit,** کەروێشکە کێوی.

**jacks** (jaks), *n.pl.* هەلماقۆ.

**jackstone** (jak′stōn′), *n.* (١) *(pl.)* هەلماقۆ (٢) بەردە هەلماقۆ.

**jade** (jād), *n.* (١) بەردێکی بەنرخی سەوزە. (٢) ڕەنگی سەوزی تۆخ.
*adj.* (١) لەم بەردە بەنرخە دروستکراوە. (٢) سەوزی تۆخ.

**jade** (jād), *n.* (١) ئەسپێکی پەککەوتەی بێ فەڕو ماندوو.
(٢) (ا) ئافرەتێکی سووك و بەرەڵا. (ب) ئافرەت (لە ڕووی گاڵتەوە)
*v.t. & v.i.* ماندووکردن؛ ماندووبوون؛ سووان.

**jaded** (jād′id), *adj.* ماندوو؛ بێ تاقەت (لەبەر زۆر کردنی شتێك)؛
ئارەزوو لێ نەبوو (لەبەر تێربوون لە شتێك).

**jag** (jag), *n.* (١) قەڵبە یا قلیشێکی قەراغ ناڕێك
(٢) چوکلە؛ نووك؛ قەراغێکی گرنج گرنجاوی: ***( a ~ of rock)***.
*v.t.* بە ناڕێکی بڕین (قوماش)؛ گرنج گرنج کردن.

**jag** (jag), *n.* (١) [Colloq.]، بارە دار؛ بارە گزرە.
(٢) [Slang]، سەرخۆشی. (٣) [Slang]، ئاهەنگێکی سەرخۆشانە.

**jagged** (jag′id), *adj.* نووك تیژ؛ چوکلەدار؛ گرنج گرنج؛
داندار (دەمی مشار): ***( a ~ rock, mountain, edge, etc.)***.

**jaggy** (jag′i), *adj.* = **jagged.**

**jaguar** (jag′wär, jag′ū-är′), *n.* پڵنگە بەڵەکی ئەمەریکی.

**jail** (jāl), *n.* بەندیخانە؛ زیندان؛ حەپسخانە.
*v.t.* خستنە بەندیخانەوە؛ خستنە زیندانەوە؛ بەندکردن.

**jail-bird** (jāl′bûrd′), *n.* [Colloq.]. (١) بەند؛ بەندکراو؛ حەپس
(٢) کەسێك کە زوو زوو دەخرێتە بەندیخانەوە.

**jailbreak** (jāl′brāk′), *n.* ڕاکردن لە بەندیخانە؛ بەندیخانە بڕین و
دەربازبوون.

**jailer, jailor** (jāl′ēr), *n.* بەندیوان؛ پاسەوانی بەندیخانە.

**jam** (jam), *v.t.* (١) تێ ئاخنین؛ تێ ترنجاندن؛ پەستنەوە؛ زۆر پڕکردن.
(٢) هاڕین؛ بریندارکردن. (٣) پاڵەپەستۆکردن.
(٤) ڕێ گرتن؛ پڕکردن و ڕێ لە هاتوچۆ گرتن:
***( The streets are ~med with cars.)***
(٥) عاستی کردن؛ عاستی بوون؛ گیران؛ بەستن:

*( The door was ~med and couldn't be opened.)*
(٦) ووزەوور خستنەسەر بەرنامەی رادیۆ یا تەلەفزیۆن:
*( to ~ a radio broadcast)*
*v.i.* (١) (ا) عاسنی بوون؛ بەستران؛ گیران
(ب) پەککەوتن بەھۆی ئەم عاستی بوون یا گیرانەوە.
(٢) پالەپەستۆکردن.
(٣) [Slang]، مۆسیقالیدان بە گەرەلاوژێ
*n.* (١) پالەپەستۆ؛ رێ گیران (بەھۆی تێ ترنجانەوە)؛ گیران یا عاستی بوون:
*( a traffic ~ )*
(٢) [Colloq.]، تەنگوچەلەمە؛ گیروگرفت.
**jam** (jam), *n.* مرەبا
**jamboree** (jam′bə-rē′), *n.* (١) زەماوەندێکی پڕ لە غەلبەغەلب؛ ئاھەنگێکی دەنگ زل. (٢) ئاھەنگێکی جیھانی دیدەوانی.
(٣) کۆنگرە؛ کۆڕێکی گەورە.
**jampack** (jam′pak′), *v.t.* [Colloq.], پڕکردن؛ پەستنەوە؛ ئاخنین:
*( a road ~ed with cars)*
**jam session,** کۆڕێکی مۆسیقای سەرپێیی؛ ئاھەنگێکی سەرپێیی مۆسیقای جاز (کە گەلێك جار زیاد لە یەك تیپ مۆسیقای تێدا لێ دەدەن).
**Jan.,** = **January.**
**jangle** (jaŋ′g'l), *v.i.*, *( the bell ~ed.)* (١) دەنگێکی ناساز لێوەھاتن:
(٢) شەرکردن؛ شەرەدەم کردن.
*v.t.* دەنگێکی ناساز لێوەھاتن.
*n.* (١) قسەکردن بە دەنگی بەرز (٢) دەنگی ناساز؛ دەنگی ناخۆش.
(٣) دەمەقالێ؛ شەرەدەم؛ شەرە دەنووك.
**janitor** (jan′i-tẽr), *n.* (١) دەرگاوان (٢) فەراش؛ بەردەست
-**janitorial** *(adj.).*
**January** (jan′ū-er′i), *n. Abbreviated* **Jan.,** رێبەندان؛ مانگی یەکەمی سال بەپێی سالنامەی زاینی.
**Jap** (jap), *n. & adj.* [Slang], یابانی (لە رووی سووکییەوە).
**Japan** (jə-pan′), *n.* یابان؛ ژاپۆن
**Japanese** (jap′ə-nēz′), *adj.* یابانی (گەل و زمان و کلتووری یابان
*n.* (١) هاوولاتییەکی یابان؛ یابانی. (٢) زمانی یابانی.
**jar** (jär), *v.i.* (١) دەنگێکی ناخۆش لێوەھاتن وەك ھی کراندن یا لێ خشاندن؛ کراندن؛ لێ خشاندن. (٢) ( ~ **on** )، پەستکردن.
(٣) راوەشان؛ راتەکان
(٤) بەیەکدادان؛ نەگونجان؛ شەرکردن؛ ناکۆکی لەنێواندا بوون.
*v.t.* (١) راتەکاندن؛ راوەشاندن:
*( The earthquake ~ed many buildings.)*
(٢) کراندن؛ لێکخشاندن.
(٣) خورپە لە دڵ دان.
*n.* (١) کرەکر؛ دەنگی ناسازی لێکخشاندن یا کراندن.
(٢) راوەشان؛ راتەکان:
*( We felt a little ~ when the engine joined the train.)*
(٣) خورپە؛ راچلەکان: *( The bad news gave me a ~ .)*
(٤) ناکۆکی؛ دەمەقالێ؛ بەیەکدادان؛ نەگونجان.
**jar** (jär), *n.* (١) شووشە؛ گۆزە؛ دیزە؛ کووپە.
(٢) پڕ دەفرێکی شووشە یا گڵین.
**jar** (jär), *n.* تۆزێ یا بە ئاستەم کراوە (دەرگا): *( on the ~ ).*
**jargon** (jär′gən, jär′gon), *n.* (١) قسەی تێکەلاوپێکەلاو.
(٢) زمانێکی سەیر کە تێگەیشتنی گران بێت
(٣) زمانێکی دوورەگ یا تێکەلاو.
(٤) زمانێکی پڕ لە زاراوەی تایبەتی بە پیشەیەك کە کەسانی تر بە ئاسانی تێی نەگەن: *( the medical ~ ).*
*v.i.* دووان بە زمانێك کە کەس بە ئاسانی تێی نەگات (یا لەبەر تێکەلاوو پێکەلاوی یا لەبەر زاراوەی تایبەتی).

**jargonize** (jär′gən-īz′), *v.i. & v.t.* بە زمانێکی پڕ لە زاراوەی تایبەتی دووان یا نووسین.
**jasmine, jasmin** (jas′min, jaz′min), *n.* یاسەمین
**jasper** (jas′pẽr), *n.* بەردێکی بەنرخی سووریاو، قاوەیی، یا زەردە.
**jaundice** (jôn′dis, jän′dis), *n.* (١) زەردوویی.
(٢) دڵ پیسی و بەخیلی و دڵ کرمێیی.
*v.t.* (١) تووشی زەردوویی کردن.
(٢) تووشی دڵ کرمێیی کردن بەھۆی دڵ پیسی و بەخیلییەوە.
**jaunt** (jônt, jänt), *v.i.* گەشتێکی کورت کردن.
*n.* گەشتێکی کورت.
**jaunty** (jôn′ti, jän′ti), *adj.* (١) پۆشتە؛ شۆخ؛ تەرپۆش
(٢) قیت؛ بەکەیف؛ دڵخۆش؛ بێباك؛ کەیف قنج.
(٣) [Obs.]، خانەدان؛ رەووشت جوان.
-**jauntily** *(adv.)*; **jauntiness** *(n.).*
**javelin** (jav′lin, jav′ə-lin), *n.* (١) تیر.
(٢) تیرێکی سەر تیژی دارین (لە ملەملانێی وەرزشدا بەکاردێت).
**jaw** (jô), *n.* (١) کاژێر؛ شەویلك؛ شەویلگە.
(٢) دەمی گیرە؛ دەمی ئامێرێکی وەك مەنگەنە.
(٣) دەمی دۆڵ، گەلی، یا دەربەندێك. (٤) [Slang]، قسەی ناشرین و کەرترانە.
*v.i.* [Slang], قسەکردن.
*v.t.* [Slang], سەرزەنشت کردن؛ شکاندن.
**jawbone** (jô′bōn′), *n.* ئێسکی شەویلگە؛ شەویلگە.
**jawbreaker** (jô′brāk′ẽr), *n.* شەویلگ شکێن: (١) ووشەیەکە پرتاندنی یا ووتنی زۆر گران بێ بە دەم. (٢) نوقوڵی رەق.
**jay** (jā), *n.* (١) قەلەباچکە. (٢) [Slang] ، کەسێکی بێ مێشکی زۆرروێژ.
**jaywalk** (jā′wôk′), *v.i.* [Colloq.], لە شەقام پەڕینەوە لە شوێنی قەدەغەوو بێ گوێ دان بە پەیرەوی پەڕینەوە: *( J~ing is illegal.)*
-**jaywalker** *(n.).*
**jazz** (jaz), *n.* (١) جاز؛ مۆسیقای جاز. (٢) مۆسیقای سەما.
(٣) [Slang]، جۆش؛ قنج وقیتی.
(٤) [Slang]، (ا) قسەی ھیچ وپووچ و بێ مانا.
(ب) فشە: *( all that ~ about his adventures)* .
*adj.* وەك مۆسیقای جاز.
*v.t.* مۆسیقای جاز لێدان.
jazz up, هێنانە جۆش؛ قسە پێوەنان؛ خۆش و جوان کردن؛ بەھارات پێوەکردن (مەجاز)؛ خێراترکردن؛ گورج کردنەوە.
**jazzy** (jaz′i), *adj.* (١) وەك مۆسیقای جاز؛ جازی.
(٢) [Slang]، بەجۆش؛ خۆش؛ گەرم؛ بەکەیف.
**jealous** (jel′əs), *adj.* (١) بەتەنگەوەھاتوو؛ بە ووریایی پارێزیکەر:
*( A man is ~ of his rights.)*
(٢) دڵ پیس: *( a ~ wife, husband, etc.)* .
(٣) بەخیل؛ بەخیلی پێ بەر.
**jealousy** (jel′əs-i), *n.* (١) دڵ پیسی. (٢) بەخیلی؛ بەخیلی پێ بردن.
**jean** (jēn, jān), *n.* (١) جۆرە قوماشێکی کەتانی ئەستووری قایمە.
(٢) *(pl.)* پانتۆڵێك کە لەم قوماشە درووستکرابێت.
**jeep** (jēp), *n.* جیپ.
**jeer** (jēr), *v.i. & v.t.* هووھا لێ کێشان؛ هووھالێکردن؛ گاڵتەپێکردن.
*n.* هووھا؛ گاڵتەپێکردن.
**Jehovah** (ji-hō′və), *n.* خودا؛ خوا؛ یەزدان.
**jejune** (ji-jōōn′), *adj.* (١) نابژێو؛ بێ کەلك (خواردەمەنی).
(٢) ووشك و بێ تام؛ ناخۆش: *( a ~ story, lecture, etc.)*
(٣) مندالانە (رەووشت)؛ ھەرزەیی: *( a ~ behavior)* .
**Jekyll and Hyde,** کەسێکی سرووشت دووفاق؛ کەسێك کە ھەر دەمە بە جۆرێك رەفتار بنوێنێ.
**jell** (jel), *v.i. & v.t.* [Colloq.], (١) بوون یا کردن بە جەلاتین یا

شیرینی‌یەکی جەلاتینی (٢) مەیین؛ دەق بەستن؛ خۆگرتن؛ توندبوونەوە:
***( Our plans haven't ~ed yet.)***
***n.*** [Colloq.], شیرینی جەلاتینی.
**jelly** (jel′i), ***n.*** شیرینی‌یەکی جەلاتینی؛ جەلاتین.
**jelly-bean** (jel′i-bēn′), ***n.*** نوقوڵێکی جەلاتینی.
**jelly-fish** (jel′i-fish′), ***n.*** (١) ماسی نەرمەلیقە.
(٢) [Colloq.]، کەسێکی بوودەڵە؛ کەسێکی بێ غیرەت.
**jeopardize** (jep′ẽr-dīz′), ***v.t.*** خستنە مەترسی‌یەوە:
***( The soldier ~ed his life to save his comrade.)***
**jeopardy** (jep′ẽr-di), ***n.*** (١) مەترسی؛ لە مەترسیدا بوون:
***( to be in ~ ; to put someone's life in ~ )***
(٢) مەترسی تاوانبارکران لە دادگادا.
**jerboa** (jẽr-bō′ə), ***n.*** گیاندارێکی بچووکە بە بازوو دەڕوات لە مشك دەچێت
**jerk** (jũrk), ***v.t.*** (١) تەکان پێدان؛ ڕاوەشاندن؛ پاڵ پێوەنان و ڕاکشان و بادان بە قایم؛ هەڵبەزودابەز پێکردن.
(٢) ( ~ out )، بە هەناسە بڕکێ و پەلە ووتن.
***v.i.*** (١) هەڵبەزودابەزکردن. (٢) فڕین (چاو، ماسولکە)؛ فرتەفرت کردن.
***n.*** (١) تەکان؛ ڕاوەشان؛ پاڵ پێوەنان و ڕاکێشان
(٢) فڕین (چاو، ماسولکە)؛ فرتەفرت. (٣) [Slang]، کەسێکی نالەبارو بێ بایەخ و بێ فەڕو کەڕو هیچی چاك لە دەست نەهاتوو.
**-jerky** ***(adv.)***; **jerkiness** ***(n.).***
**jerk** (jũrk), ***v.t.*** توێ کردنی گۆشت و ووشك کردنەوەی و هەڵگرتنی.
***n.*** گۆشتی توێ توێ کراوی ووشك کراوە (بەتایبەتی گۆشتی گا و مانگا).
**jerky** (jũr′ki), ***adj.*** (١) هەڵبەزودابەزکەر؛ پڕ لە تاسە:
***( a ~ automobile ride)***
(٢) فرتەفرتکەر (ماسولکە).
**jerky** (jũr′ki), ***n.*** گۆشتی گا و مانگای توێ توێ کراوی ووشك کراوە.
**jersy** (jũr′zi), ***n.*** (١) قوماشێکی نەرمی چنراوی خوری یا ئاوریشمی کشاو (٢) بلووسێك لەم قوماشە کرابێت (کەشتی‌یەوان و وەرزشکاران لەبەری دەکەن؛ (٣) بلووسێکی چنراوی تەسك.
**jest** (jest), ***n.*** (١) توانج؛ لاپلار؛ پلار. (٢) نوکتە.
(٣) گاڵتە ***( to say something in ~ )*** .
(٤) کەسێك یا شتێك کە مایەی پێکەنین و گاڵتەپێکردنە؛ گاڵتەچی خەڵك.
(٥) [Obs.]: (ا) کارێکی گرنگ. (ب) چیرۆکێکی فشە.
***v.i.*** (١) توانج تێگرتن؛ کلك پێوەکردن؛ پلار تێگرتن.
(٢) گاڵتەکردن؛ نوکتەبازی کردن.
**jester** (jes′tẽr), ***n.*** گاڵتەباز؛ نوکتەباز (بەتایبەتی کەسێکی ئەنتیکە کە پیشەی قۆشمەبازی و نوکتەبازی بووە لە کۆشکی پاشاکانی سەدەی ناوەڕاستدا
**Jesuit** (jezh′o͞o-it, jez′ū-it), ***n.*** (١) جەزوێتی ئەندامی لقێکی ئاینی خاچ پەرستی کە ناوی " جەزوێت " ە. (٢) [j-]: کەسێکی فێڵباز.
**Jesus** (jē′zəs), ***n.*** عیسا
**jet** (jet), ***v.i. & v.t.*** فیچقەکردن؛ بە گوژم هاتنەدەرەوە لە کونێکی تەسکەوە
***n.*** (١) فیچقە؛ فیچقەی ئاو یا شلەی تر. (٢) لوولە؛ دەم (بۆری)؛ ئاوپژێن.
(٣) فڕۆکەی فیشکەدار
**jet** (jet), ***n.*** (١) کانزایەکی ڕەشی ڕەقە خشڵی لێ دروست دەکرێ.
(٢) ڕەشێکی بریقەدار؛ قەترانی ڕەش.
***adj.*** (١) لەم کانزا ڕەشە بریقەدارە دروستکراوە. (٢) ڕەش؛ ڕەشی قەترانی.
**jet airplane, jetliner,** فڕۆکەی فیشکەدار
**jetblack** (jet′blak′), ***adj.*** ڕەشی بریقەدار
**jet-propelled** (jet′prə-peld′), ***adj.*** بە ئامێری فیشکەدار لێ دەخوڕێنت.
**jet propulsion,** لێخوڕین بە مەکینەی فیشکەدار (فڕۆکە، کەشتی، بەلەم).
**jet stream,** (١) تەوورژمی بایەکی بەهێز
(٢) دووکەڵی دوای فڕۆکەی فیشکەدار.
**jetsam** (jet′səm), ***n.*** (١) بارێکی فڕێدراو لە کەشتی یا فڕۆکەوە لەکاتی ناکاویدا بۆ بار سووکی. (٢) بارێکی فڕێدراوی وەها کە ئاو ڕای بماڵێتە کەناری دەریا. (٣) شتومەکی فڕێدراو
**jettison** (jet′ə-s'n, jet′ə-z'n), ***n.*** (١) فڕێدانی باری فڕۆکە و کەشتی لەکاتی ناکاویدا بۆ بار سووك کردنی. (٢) باری وەها فڕێدراو.
***v.t.*** (١) فڕێدانی باری فڕۆکە و کەشتی لەکاتی ناکاویدا بۆ بار سووك کردنی
(٢) فڕێدانی شتی بێ کەڵك.
**jetty** (jet′i), ***n.*** (١) دیواری بەربەستی بەرزاوی دەریا و پاراستنی بەندەر، ئەسکەلە، یا کەناری دەریا (٢) مۆڵگەی کەشتی.
**jetty** (jet′i), ***adj.*** ڕەشی قەترانی؛ زۆر ڕەش و بریقاوە.
**Jew** (jo͞o), ***n.*** جوولەکە؛ جوو.
**jewel** (jo͞o′əl), ***n.*** (١) خشڵ؛ گەوهەر.
(٢) کەسێك یا شتێکی زۆر خۆشەویست و بەنرخ.
**jeweler, jeweller** (jo͞o′əl-ẽr), ***n.*** زەڕەنگەر.
**jewelery, jewellery** (jo͞o′əl-ri), ***n.*** خشڵ.
**Jewish** (jo͞o′ish), ***adj.*** هی جوولەکە؛ تایبەتی بە جوولەکە.
**Jewry** (jo͞o′ri), ***n.*** (١) گەڕەکی جوولەکەکان؛ گەڕەکی جوولەکە.
(٢) گەلی جوولەکە؛ جوو زبان. ***( American J~ )*** .
**jibe** (jīb), ***v.i.*** (١) لادانی بایەوانی کەشتی لە لایەکی کەشتی‌یەکەوە بۆ لاکەی تری. (٢) گۆڕینی ڕێبازی کەشتی بۆ ڕوو پێ گۆڕینی بایەوانەکەی
(٣) [Colloq.]، گونجان؛ ڕێککەوتن لەگەڵ یەك؛ یەککەوتن (بیروڕا):
***( Our views don't ~ .)***
***v.t.*** (١) لادانی بایەوانی کەشتی لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر.
(٢) ڕێباز بە کەشتی گۆڕین بۆ ڕوو پێ گۆڕینی بایەوانەکەی.
***n.*** (١) لادانی بایەوانی کەشتی بایەوان لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر.
(٢) ڕێباز گۆڕانی کەشتی بۆ ڕوو پێ گۆڕینی بایەوانەکەی.
**jibe** (jīb), ***v.i. & v.t.*** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین
***n.*** گاڵتەپێکردن؛ گاڵتە؛ قەشمەری.
**jiffy** (jif′i), ***n.*** [Colloq.], هەناسەیەك؛ ماوەیەکی زۆر کەم یا کورت:
***( done in a ~ ; I'll be back in a ~ .)***
**jig** (jig), ***n.*** (١) هەڵپەڕکێ‌یەکی بە جۆش و پڕ لە هەڵبەزینەوە.
(٢) مۆسیقای هەڵپەڕکێ‌یەکی وەها. (٣) جۆرە قولاپێکی ڕاوەماسی‌یە.
(٤) ئامێرێك کە بە ڕاوەشاندن کاری پێ دەکرێ (بێژنگی پاکردنەوەی کانزا. سمۆی ئەلەکتریکی). (٥) [Slang]، یاری؛ فێڵ؛ گاڵتە.
***v.i. & v.t.*** (١) هەڵپەڕین بە جۆش. (٢) ڕاوەشاندن؛ لە بێژنگ دان.
the jig is up, [Slang], کار لە کار ترازاوە؛ یاری تەواو!
**jigger** (jig′ẽr), ***n.*** (١) سەماکەری بە جۆش.
(٢) پێوانەیەکی بچووکە بۆ پێوانی خواردنەوەی سەرخۆشکەر.
(٣) هێ؛ ئامێرێك یا شتێك کە ناوەکەی نەزانرێ یا لە بیرچووبێ.
(٤) دارێکی کورتی سەر ئاسنینەی گۆڵف.
(٥) جۆرە قولاپێکی ڕاوەماسی‌یە. (٦) بێژنگی کانزا پاکردنەوە.
(٧) (ا) بایەوانێکی بچووك. (ب) خولخولۆکەی کارپێکردنی بایەوانی کەشتی.
(ج) بەلەمێکی بایەوانی بچووك.
(د) تەوەرەی پێشەوەی بەلەم یا کەشتی بایەوانی.
**jiggle** (jig′'l), ***v.t. & v.i.*** لەراندنەوە؛ لەرینەوە.
***n.*** لەرە؛ لەرانەوە.
**jigsaw** (jig′sô′), ***n.*** مشارێکی دەم باریکە بۆ بڕینەوەی شت بە خواروخێچی.
**jigsaw puzzle,** مەتەڵ یا یاری‌یەکە بریتی‌یە لە پارچە دار یا مقەبای خواروخێچ کە ئەگەر بە ڕاستی بنرێن بەیەکەوە شێوەیەکی لێ دەردەچێ.
**jihad** (ji-häd′), ***n.*** (١) خەباتی ئاینی.
(٢) خەبات کردن بۆ یا دژی بیروباوەڕێك.

**jillion** (jil′i-ən), *n.* ژمارەیەکی بێ سنوور؛ ژمارەیەکی لە ژماردن نەهاتوو

**jilt** (jilt), *n.* ئافرەتێك کە دلدارەکەی بەجێ دەهێڵێ پاش ئەوەی بەڵێنی خۆشەویستی پێ دەدات.

*v.t.* بەجێهێشتن یا واز لە دلدار هێنان پاش بەڵێنی خۆشەویستی پێدانی.
*( When he lost his money she ~ed him.)*

**Jim Crow** (jim′ krō′), (١) [Colloq.]، ڕەگەزپەرستی دژی قولەڕەش ٢ [Slang]، قولەڕەشێك (لە ڕووی سووکییەوە).

**jingle** (jiŋ′g'l), *v.i.* (١) زرنگانەوە (زەنگ، پارەی وردە... هتد)؛ زرنگەزرنگ کردن؛ ڕەهاتن؛ هارەلێهاتن
(٢) یەك ئاواز یا یەك ئەوا بوونی هۆنراوە

*v.t.* زرنگانەوە؛ زرە لێ هەڵسان؛ هارە لێ هەڵساندن

*n.* (١) زرنگە؛ زرە؛ زرەزر؛ زرنگانەوە؛ هارە
(٢) هەڵبەستێکی یەك ئاواز

**jingo** (jiŋ′gō), *n.* کەسێکی جەنگاوەرو شۆڤێنی

*adj.* شۆڤێنی و جەنگاوەر

by jingo!, [Colloq.], سوێندێکی بێ مانایە لەسەر سووربوون یا سەرسامی دەگەیەنێت.

-jingoist *(n.)*; jingoistic *(adj.)*.

**jingoism** (jiŋ′gō-iz'm), *n.* شۆڤێنیتی و جەنگاوەری.

**jink** (jiŋk), *v.i.* خێرا ڕاکردن و زوو زوو پێچکردنەوە بۆ دەربازبوون لە دەست شتێك یا کەسێك

*n.* (١) خۆ لێ لادان (بە کوتوپڕ پێچکردنەوە).
(٢) *(pl.)* شەڕەشەق؛ زرمەزل؛ گاڵتەوگەپ.

**jinn, jinni** (jin), *n.* جنۆکە

**jinx** (jiŋks), *n.* [Slang]. کەسێك یا شتێکی بەدووم.

*v.t.* [Slang], بەختی ڕەش بۆ هێنان؛ نوشتەلێکردن: *( to put a ~ on)*.

**jitter** (jit′ēr), *v.i.* [Slang], (١) جرت‌وفرت کردن؛ هاتن و چوون بە جریانە ٢ سەماکردن بە جۆش

the jitters, [Slang], جرت‌وفرت؛ جرینی؛ بێ ئارامی؛ سەرشێتی.

**jitterbug** (jit′ēr-bug′), *n.* [Slang], سەماکەرێکی بە جۆش بە مۆسیقای جاز.

*v.i.* [Slang], سەماکردن بە جۆش بە مۆسیقای جاز.

**jittery** (jit′ēr-i), *adj.* [Slang], بە جرت‌وفرت؛ جرین؛ جرت‌وفرتکەر؛ بێ ئارام

**jive** (jīv), *n.* [Slang]. (١) گاڵتەوگەپ کردن لەلایەن جازلێدەرەوە لەکاتی مۆسیقالێدانەکەدا (٢) زمانی تایبەتی بە جازلێدەرو گوێگرانی (٣) مۆسیقای جاز (٤) درۆ؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بەمەڵەبەر؛ گاڵتە.

*v.i.* [Slang], (١) مۆسیقای جاز لێدان (٢) سەماکردن بە جاز
(٣) گاڵتەکردن؛ درۆکردن

*v.t.* [Slang], درۆ لەگەڵ کردن؛ گاڵتە لەگەڵ کردن

**job** (job), *n.* (١) فرمان؛ کار؛ ئیش.
(٢) کارێکی تایبەتی کە بە کرێ یا بە پارە دەکرێت.
(٣) (ا) ئەو شتەی کاری لەسەر دەکرێ (ب) ئەنجامی کارەکە.
(٤) پلەوپایە؛ کاربەدەستی.
(٥) ئەرك؛ ئەرکی سەرشان:
*( It was her ~ to get her younger brother ready for school.)*
(٦) [Colloq.]، کارێك یا ئیشێکی گران.
(٧) [Colloq.]، بار؛ چۆنێتی.
(٨) [Colloq.]، تاوان (بەتایبەتی دزی یا ماڵ برین).
(٩) [Colloq.]، کارێك کە بە ڕواڵەت بۆ سوودی گشتی کرابێت، بەڵام لە ڕاستیدا بۆ سوودی خۆ کراوە
(١٠) [Colloq.]، زیان لێدان؛ زیان؛ ئازاردان.

*v.i.* (١) کاری هەمەچەشنە کردن (٢) بە یەك یەك، پارچە پارچە، یا دانە دانە ئیش کردن (٣) دەڵاڵی کردن

(٤) بەکارهێنانی پلەوپایەی خۆ بۆ سوودی تایبەتی.

*v.t.* (١) شتومەك کڕین لە کارگەو فرۆشتنەوەی بە تاك فرۆشان.
(٢) قۆنتەرات وەرگرتن و دانەوەی بە قۆنتەرات بە خەڵکی تر؛ دەڵاڵی کردن
(٣) جێبەجێکردنی کاروباری گشتی یا ڕەسمی، بە ناپاکی بۆ سوودی خۆ.
(٤) بە کرێ دان (ئەسپ، عەرەبانە).

by the job, بە یەك یەك، دانە دانە، پارچە پارچە، یا جیا جیا (کردنی کارێك بە پارە).

odd jobs, هەموو جۆرە فرمانێك؛ کاری هەمەچەشنە:
*( to work at odd jobs)*

on the job, (١) [Colloq.]، لەکاتی ئیش کردندا.
(٢) [Slang]، بە تەنگ فرمان یا ئەرکی سەرشانەوە هاتوو؛ بە دڵ ئیش کردوو.

**jobber** (job′ēr), *n.* (١) دەڵاڵ: کەسێك کە شتومەك بە کۆ دەکڕێ و دەیفرۆشێتەوە بە تاکفرۆش.
(٢) کەسێك کە دانە دانە یا یەك یەك ئیش بە قۆنتەرات دەگرێ و دەیکات.
(٣) کەسێك کە کاری ڕەسمی بە ناپاکی بەکاردەهێنێ بۆ سوودی خۆی.
(٤) دەڵاڵی بروانامەی دارایی

**jockey** (jok′i), *n.* ئەسپ سواری پێشبڕکێی ئەسپ.

*v.t. & v.i.* (١) ئەسپ سواری کردن لە پێشبڕکێی ئەسپدا
(٢) گزی کردن؛ فێڵ کردن؛ دەستبڕین.
(٣) مناوەرە کردن یا فێڵ کردن بۆ جێی باش گرتن، سوود دەسکەوتن یا خۆ پێشخستن: *( The candidates were ~ing for position.)*.

**jockstrap** (jok′strap′), *n.* ئاوگەڵ بەند (وەرزشکار لەبەری دەکەن)؛ پێشەڵ بەند؛ بەرموسڵدان بەند.

**jocose** (jō-kōs′), *adj.* (١) ئەنتیکە؛ گاڵتە؛ سەیر.
(٢) گاڵتەباز؛ ئەنتیکە (مرۆڤ)؛ سەیرخۆش.

**jocosity** (jō-kos′ə-ti), *n.* (١) سەیرخۆشی؛ نوکتەبازی؛ گاڵتەبازی.
(٢) نوکتە؛ شتێکی ئەنتیکە یا سەیر.

**jocular** (jok′yoo-lēr), *adj.* (١) گاڵتەباز؛ ئەنتیکە؛ سەیرخۆش؛ قۆشمە. (٢) گاڵتە؛ بە گاڵتەوە؛ نوکتە.

**jocularity** (jok′yoo-lar′ə-ti), *n.* (١) گاڵتەبازی؛ نوکتەبازی.
(٢) نوکتە؛ گاڵتەیەك.

**jocund** (jok′ənd, jō′kənd), *adj.* دەم بە پێکەنین؛ دڵخۆش؛ ڕووخۆش.

**jocundity** (jō-kun′də-ti), *n.* (١) دڵخۆشی؛ ڕووخۆشی.
(٢) کارێك یا وتەیەکی دەم بە پێکەنینانە.

**jog** (jog), *v.t.* (١) پاڵ پێوەنان، ڕاتەکاندن، یا ڕاوەشاندن بە ئەسپایی.
(٢) سیخورمەلێدان. (٣) بیرخستنەوە؛ هێنانەوەبیر.

*v.i.* (١) ڕاکردن لەسەرخۆ؛ لۆقەکردن؛ هەروەڵەکردن:
*( I ~ five times a week.)*
(٢) ( ~ on; ~ along)، لەسەرخۆ ڕۆیشتن یا بەردەوام بوون.

*n.* (١) سیخورمە؛ پاڵ پێوەنان یا ڕاتەکانێکی بە ئەسپایی.
(٢) لۆقە؛ ڕاکردنێکی لەسەرخۆ؛ هەروەڵە.

**jog** (jog), *n.* (١) دەرپۆقین؛ چوکڵە؛ نووك: *( a ~ in the wall)* .
(٢) لادان یا ڕێ گۆڕینێکی کوتوپڕی.

*v.i.* پێچکردنەوە.

**joggle** (jog′'l), *v.t. & v.i.* ڕاوەشاندن یا ڕاتەکاندن بە هێواشی

*n.* ڕاوەشاندن یا ڕاتەکاندنێکی هێواش.

**joggle** (jog′'l), *n.* (١) چاڵ و زمانە بۆ کردنی دوو دار یا بەرد بۆ بەیەکداچوون و لێکدان. (٢) چاڵ، قلیش، یا زمانەیەك بۆ ئەم لێکدانە.

*v.t.* لێکدانی دوو دار یا بەرد بە چاڵ و زمانە.

**jog trot,** (١) لۆقە؛ ڕاکردنێکی لەسەرخۆ؛ هەروەڵە.
(٢) لەسەرخۆ کردنی کارێك.

**John Doe,** (١) کەسێکی خەیاڵی یا نەناسراو؛ فلان کەس؛ فلان و فیسار.
(٢) کەسێکی سادە یا ئاسایی.

**John Hancock, John Henry,** ئیمزا یا مۆری کەسێك.

**Johnny-on-the-spot** (jon′i-on′*thə*-spot′), *adj.* هەمیشە ئامادە
*n.* کەسێکی هەمیشە ئامادە.
**joie de vivre** (zhwå′də-vēvr′), [Fr.], خۆشی ژیان؛ ڕابواردن؛ کەیف
**join** (join), *v.t.* (١) پێکەوەبەستن؛ پێکەوەلکاندن؛ دانەدەم.
(٢) یەکگرتن؛ یەك پێگرتن: ***(to ~ forces; to ~ in marriage)*** .
(٣) چوونە ڕیزەوە؛ چوونەناو؛ بوون بە ئەندام یا بەشێك لە:
***(He ~ed a labor union.)***
(٤) لێکدان؛ بوون بە یەك: ***(The path ~s the highway.)*** .
(٥) لەگەڵدا بوون یا چوون؛ هاودەمی کردن: ***(J~ me in a walk.)*** .
(٦) گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆ: ***(The soldier ~ed his regiment.)*** .
(٧) [Colloq.]، بە تەنیشت یەکەوە بوون؛ هاو سنوور بوون.
(٨) لێکدان (ئەندازە).
*v.i.* (١) بەیەکگەیشتن؛ لێکدان.
(٢) چوونە ڕیزەوە؛ بوون بە ئەندام تێدا.
(٣) بەشداری کردن ***(to ~ in the conversation, singing, etc.)*** .
*n.* (١) لێکدانێك؛ بەیەکگەیشتنێك.
(٢) جێی لێکدان یا بەیەکگەیشتن.
**joinder** (join′dẽr), *n.* (١) بەیەکگەیشتن؛ لێکدان؛ بوون بەیەك
(٢) بوون بەیەکی چەند داواچییەك یا داوا لەسەرکراوێك (دادگەری).
**joiner** (join′ẽr), *n.* (١) بەیەکگەیێنەر (مرۆڤ، شت). (٢) دارتاش.
(٣) [Colloq.]، کەسێك کە ببێ بە ئەندام لە گەلێك ڕێکخراودا یا خۆی پێیاندا هەڵپەسێرێ.
**joinery** (join′ẽr-i), *n.* (١) دارتاشی (٢) شتی دارتاش درووستکەر.
**joint** (joint), *n.* (١) جێی بەیەکگەیشتنی دوو شت
(٢) چۆنێتی ئەم بەیەکگەیشتنە. (٣) پارچەیەکی لەیەکدراو لەگەڵ پارچەی تردا.
(٤) پارچەیەکی گەورە گۆشت بە ئێسقانەوە. (٥) ئەنجامە.
(٦) جومگە؛ خرتکە. (٧) جێی لق لێبوونەوەی لقێك.
(٨) درزی بەرد یا تاوێر (زەمینناسی). (٩) [Slang]، خانوو؛ ماڵ.
(١٠) [Slang]، چێشتخانە، بار، تیاترۆ، یا چایخانەیەکی هەرزانبەهاو ناوبانگ نەختێك خراپ. (١١) [Slang]، جگەرەی مەریوانە
*adj.* (١) هاوکات؛ هەمان کات.
(٢) دووقۆڵی؛ دوولایی: ***(a ~ communique)*** .
(٣) هاوبەش؛ هی دوو بەشدار یا زیاتر: ***(~ property)*** .
(٤) بەشدار؛ هاوبەش. ***(a ~ owner)*** .
*v.t.* (١) بەیەکگەیاندن یا پێکەوەبەستن (بە ئەنجامە)
(٢) گۆشت بڕین بە ئێسقانەوە؛ جیاکردنەوە لە جومگەدا.
**out of joint,** (١) لە جێ چوو؛ لە خرتکە چوو؛ لەیەك ترازاو.
(٢) پەشێواو؛ شێواو؛ شیرازە تێکچوو.
**joint account,** حسابی هاوبەشی یا دووقۆڵی بانق.
**joint committee,** لیژنەی دووقۆڵی یا زیاتر.
**jointly** (joint′li), *adv.* پێکەوە؛ بە دووقۆڵی؛ بە هاوبەشی؛ بە کۆمەڵ.
**joint resolution,** بڕیاری دووقۆڵی (لەلایەن دوو لقی پەرلەمانەوە).
**joint return,** ئیستیمارەی باجی دەسکەوتی ژن و مێردێك بە دووقۆڵی نەك بە جیا جیا
**jointure** (join′chẽr), *n.* بەجێهێشتنی زەوی‌وزار لە وەسیەتنامەدا لە مێردەوە بۆ ژن
**joist** (joist), *n.* دەستەك؛ نێرگە
**joke** (jōk), *n.* (١) نوکتە؛ ووتەیەکی نەنتیکە یا سەیر.
(٢) گاڵتە؛ گەمە. (٣) کەسێکی گاڵتەچی یا هیچ‌وپووچ؛ شتێکی هیچ‌وپووچ و بێ بایەخ.
*v.i.* (١) نوکتە ووتن؛ نوکتەبازی کردن. (٢) گاڵتەکردن؛ بە گاڵتەوە ووتن.
*v.t.* گاڵتەپێکردن؛ کڵك پێوەکردن؛ پێ پێکەنین.
**no joke,** بێ گاڵتە؛ مەسەلەکە گاڵتەی لەگەڵ ناکرێ
**practical joke,** پەنگ؛ پەنگ پێدان؛ گاڵتەپێکردنێك کە هەر بە دەم نەبێت، بەڵکو کرداریشی لەگەڵ بێت:
***(to play a practical joke on someone)***
**joker** (jōk′ẽr), *n.* (١) نوکتەچی؛ نوکتەباز؛ گاڵتەباز؛ قۆشمەچی.
(٢) گیروگرفتێکی شاراوە (٣) مەرجێك یا بەندێکی شاراوە لە یاسایەکدا
(٤) جۆکەر (قومار).
**jollify** (jol′ə-fī′), *v.t. & v.i.* دڵخۆش کردن.
**jolliness** (jol′i-nis), *n.* ~ **jollify.**
**jollity** (jol′ə-ti), *n.* (١) کەیف قنجی؛ بە کەیفی
(٢) ئاهەنگ؛ زەماوەند.
**jolly** (jol′i), *adj.* (١) بە کەیف؛ کەیف قنج؛ ڕووخۆش
(٢) [Colloq.]، خۆش (کات بەسەربردن): ***(to have a ~ time)*** .
*adv.* زۆر؛ بە تەواوی: ***(~ well)*** .
*v.t. & v.i.* [Colloq.], (١) دڵخۆش کردن (بە نوکتەو مەرایی... هتد)؛
(٢) کەیف خۆش کردن. (٣) گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.
**jolt** (jōlt), *v.t.* (١) ڕاوەشاندن؛ ڕاتەکاندن؛ لەرانەوە؛ تاسەپێکردن:
***(The old car ~ed its passengers as it went over the rough road.)***
(٢) شڵەژاندن؛ تێکدان.
*v.i.* ڕاوەشان؛ ڕاتەکان؛ تاسەکردن؛ لەرینەوە.
*n.* (١) تەکان؛ ڕاتەکان؛ پاڵ؛ لەرینەوە؛ ڕاوەشان؛ تاسە.
(٢) شڵەژان؛ تێکچوون؛ خورپە؛ داچڵەکین؛ ڕاتەکان (هەست):
***(The news gave us all a ~ .)***
-jolty *(adj.)*.
**Jonah** (jō′nə), *n.* (١) " یونس " ی پەیامبەر
(٢) بەشێکە لە " ئینجیل " ی کۆن. (٣) کەسێکی بەدووم.
**jongleur** (joŋ′glẽr), *n.* شایەرێکی گەڕۆك.
**Jordan** (jôr′d'n), *n.* (١) ڕووباری ئوردون. (٢) ئوردون.
**Jordan almond,** نوقوڵە بادەمی.
**jostle** (jos′'l), *v.t. & v.i.* پاڵەپەستۆ کردن؛ پاڵ بەیەکەوە نان.
*n.* پاڵەپەستۆ؛ پاڵ؛ پاڵ نان
**jot** (jot), *n.* نەخت؛ تۆز؛ نەختاڵ؛ دەنك؛ تۆسقاڵ:
***(She doesn't care a ~ for him.)***
*v.t.* (~ down), نووسین؛ تۆمارکردن (تێبینییەکی کورت):
***(to ~ down a note, remark, name, etc.)***
**journal** (jũr′n'l), *n.* (١) بیرنامە؛ یادنامەی ڕۆژانە؛ یادداشت.
(٢) پەڕاوی بیرنامە. (٣) کارنامەی کۆڕ، پەرلەمان، کۆمیتە، یا ڕێکخراوێك
(٤) تۆماری ڕۆژانەی کەشتییەك. (٥) ڕۆژنامە.
(٦) گۆڤار. (٧) تۆماری ڕۆژانەی دەزگایەکی بازرگانی
(٨) ڕاگرە یا جێی ڕاگیربوونی تەوەر (مەکینەگەری).
**journalese** (jũr′n'l-ēz′, jũr′n'l-ēs′), *n.* شێوازی نووسینی ڕۆژنامەو گۆڤار.
**journalism** (jũr′n'l-iz'm), *n.* (١) ڕۆژنامەگەری؛ ڕۆژنامەچێتی.
(٢) نووسینی ڕۆژنامەو گۆڤار
(٣) ڕۆژنامەو گۆڤار.
**journalist** (jũr′n'l-ist), *n.* (١) ڕۆژنامەگەر؛ ڕۆژنامەچی.
(٢) یادداشت نووس؛ بیرنامەی ڕۆژانە نووس.
-journalistic *(adj.)*; journalistically *(adv.)*.
**journalize** (jũr′n'l-īz′), *v.t. & v.i.* تۆمارکردن (لە بیرنامە، یا تۆماری ڕۆژانەی دەزگایەکی بازرگانیدا).
**journey** (jũr′ni), *n.* گەشت؛ گەڕان:
***(a ~ of three days; a three days' ~ ; to make a ~ ; to go on a ~ ).***
*v.i.* گەشتکردن؛ گەڕان؛ چوون بۆ شوێنێك.
**journeyman** (jũr′ni-mən), *n.* (١) کرێکار؛ کارگەر.

(۲) تازه وەستا؛ کارگەرێکی کارامە یا شارەزا

**journeywork** (jūr′ni-wūrk′), *n.* کاری کارگەرێکی شارەزا.

**joust** (just, joust, jōōst), *n.* (۱) شەڕەتیرێکی ڕاستەقینە یا درۆ لەنێوان دوو سوارچاکدا بە سواری ئەسپەوە.
(۲) (*pl.*) کێ بڕکێ؛ ملەملێ؛ پێشبڕکێ.

*v.i.* شەڕەتیرکردن بە ڕاستی یا درۆ (لەنێوان دوو سوارچاکدا بە سواری ئەسپەوە)

**Jove** (jōv), *n.* گەورەخودای ئەفسانەی ڕۆمانی.

**by Jove!,** بە خودا! (سوێندێکە سەرسامی یا لەسەر سووربوون دەردەبڕێ).

**jovial** (jō′vi-əl), *adj.* (۱) (ا) تایبەتی بە گەورەخودای ئەفسانەی ڕۆمانی (ب) تایبەتی بە ئەستێرەی کاروانکەر " جۆپیتەر ".
(۲) ڕووخۆش؛ دەم بە پێکەنین؛ بەکەیف.

**joviality** (jō′vi-al′ə-ti), *n.* ڕووخۆشی؛ دەم بە پێکەنینی؛ کەیف خۆشی

**jowl** (joul, jōl), *n.* (۱) شەویلکەی خوارەوە بە چەناگەو ڕوومەتەوە
(۲) ڕوومەت

**jowl** (joul, jōl), *n.* (۱) غەبغەبەی مرۆڤ (۲) (ا) غەبغەبەی گا و مانگا (ب) چەرمی ئەرملی باڵندەی وەك مریشك و کەڵەشێر و قەلەموون.
(۳) سەرو ملی ماسی.

**joy** (joi), *n.* (۱) خۆشی؛ شادی؛ دڵخۆشی
(۲) هۆو سەرچاوەی شادی. (۳) شادی دەربڕین

*v.i.* دڵخۆش بوون؛ شادبوون؛ کەیف پێ هاتن.

*v.t.* (۱) دڵخۆش کردن؛ شادکردن. (۲) [Archaic]، پێ خۆش بوون.

**joyful** (joi′fəl), *adj.* (۱) شاد؛ بەختیار؛ دڵخۆش: *( a ~ person)*.
(۲) خۆش (دەنگوباس)؛ دڵخۆشکەر: *( ~ news)*.

**-joyfully** *(adv.)*; joyfulness *(n.)*.

**joyless** (joi′lis), *adj.* (۱) خەمبار؛ غەمگین؛ مات.
(۲) ناخۆش (دەنگوباس).

**-joylessly** *(adv.)*; joylessness *(n.)*.

**joyous** (joi′əs), *adj.* = joyful.

**-joyously** *(adv.)*; joyousness *(n.)*.

**joy ride,** گەڕانێك بە ئوتومبیل (بەتایبەتی هەر بۆ کەیف و بە خێرایی و بێباکانە)

**Jr., jr.** = junior.

**jubilant** (jōō′b'l-ənt), *adj.* زۆر بەکەیف؛ دڵخۆش؛ شاد؛ گەشکەدار: *( A ~ crowd welcome him.)*

**-jubilantly** *(adv.)*.

**jubilate** (jōō′bə-lā′tē, jōō′bə-lä′tē), *v.i.* لە خۆشید ئاهەنگ گێڕان؛ کەیف خۆشی دەربڕین.

**jubilation** (jōō′b'l-ā′shən), *n.* (۱) دڵخۆشی؛ خۆشی (بە بۆنەی سەرکەوتنەوە) (۲) ئاهەنگ و زەماوەند (بە بۆنەی سەرکەوتنەوە).

**jubilee** (jōō′b'l-ē′), *n.* (۱) یاد، بەتایبەتی: (ا) یادی پەنجا ساڵە *( golden ~ )*
(ب) یادی بیست و پێنج ساڵە: *( silver ~ )*
(ج) یادی شەست یا حەفتا و پێنج ساڵە: *( diamond ~ )*.
(۲) لێخۆشبوونی پاپا لە گوناهباران هەموو بیست و پێنج ساڵ جارێك؛ ماوەی ئەم لێخۆشبوونە (۳) کاتی ئاهەنگ و خۆشی.
(٤) شادی؛ خۆشی

**Judaic** (jōō-dā′ik), *adj.* (۱) هی جوولەکە (۲) هی ئاینی جوولەکە

**Judaism** (jōō′di-iz′m), *n.* (۱) ئاینی جوولەکە.
(۲) پەیڕەوی کردنی خوو و نەریت و پەیڕەوی جوولەکە.

**Judas** (jōō′dəs), *n.* (۱) جوداس (یەکێك بوو لە دوانزە قوتابییەکەی عیسا کە ناپاکی لەگەڵ کرد و بە هەڵواسینی دا). (۲) کەسێکی ناپاك.

**Judas tree,** دار ئەرخەوان.

**judge** (juj), *n.* (۱) دادپرس؛ دادگەر؛ دادوەر
(۲) سەرپشك (یاری، ناکۆکی، ملەملێ).
(۳) هەڵسەنگێنەر؛ پاك و پیس کەر؛ شارەزا: *( a good ~ of horses, books, music, etc.)*

*v.i.* (۱) دادپرسین؛ دادپرسی کردن؛ دادگەری کردن.
(۲) سەرپشکی کردن؛ خستن بە لایەکدا (ملەملێ، ناکۆکی)؛ بڕیار لەسەر دان.
(۳) فەرمان دەرکردن؛ فەرمان دان.
(٤) هەڵسەنگاندن؛ پاك و پیس کردن؛ ڕا دان دەربارە.
(٥) سەرزەنشت کردن؛ لۆمەکردن؛ خەتابارکردن: *( "J~ not that ye be not ~d.")*
(٦) بە باشتر زانین: *( We ~d it better to start at once.)*.

**judgeship** (juj′ship), *n.* پلەو فەرمانی دادگەر؛ کاروبارو ئەرکی سەرشانی دادوەر.

**judgement** (juj′mənt), *n.* (۱) بڕیار.
(۲) بڕیاری دادگا: *( The ~ was against him.)*.
(۳) قەرزێك لە ئەنجامی بڕیاری دادگادا.
(٤) سزای خواکردە.
(٥) سەلیقە؛ بۆچوونێکی باش؛ توانای پاك و پیس کردن: *( a man of good ~ )*
(٦) ڕا: *( in my ~ )*.

**judgement day, Judgement Day,** ڕۆژی قیامەت؛ ڕۆژی داوەری.

**judicatory** (jōō′di-kə-tôr′i, jōō′di-kə-tō′ri), *adj.* دادگەری؛ دادپرسی؛ دادی.

*n.* (۱) دادگا. (۲) دەزگای دادگەری؛ دەزگاکانی دادوەری بە کۆمەڵ.

**judicature** (jōō′di-kə-chēr), *n.* (۱) دادپرسین؛ دادگەری.
(۲) پلەو دەسەڵات و کاری دادپرس.
(۳) ڕادەی دەسەڵاتی دادگایەك یا دادپرسێك. (٤) دادگا.
(٥) دەزگای دادگا و دادپرسان بە کۆمەڵ.

**judicial** (jōō-dish′əl), *adj.* (۱) دادی؛ دادگایی؛ دادگەری: *( the ~ system)*
(۲) بە فەرمانی دادگایەك یا دادگەرێك کراوە.
(۳) دادپرسی؛ دادگەری. (٤) بۆ دادگەر دەشێت.
(٥) ڕەوا؛ دادپەروەر؛ بە سەلیقە و بێ لایەن و ژیر لە بڕیارداندا: *( a man with a ~ mind)*

-judicially *(adv.)*.

**judiciary** (jōō-dish′i-er′i, jōō-dish′ēr-i), *adj.* دادگەری؛ دادی؛ دادگایی.

*n.* (۱) دەزگا و دەسەڵاتی دادگەری (کە بەشێکە لە دەسەڵات و دەزگاکانی میری): *( The ~ must be independent.)*
(۲) دادپرسان؛ داگەران.

**judicious** (jōō-dish′əs), *adj.* ژیر؛ پاك و پیس کەر؛ عاقڵ؛ تێگەیشتوو.

-judiciously *(adv.)*; judiciousness *(n.)*.

**judo** (jōō′dō), *n.* جودۆ: زۆرانبازی یابانی.

**jug** (jug), *n.* (۱) دەفرێکی گڵین، شووشە، یا کانزایی (سوراحی، شووشە، گۆزە، لوولێنە، مەسینە، شەربە، دیزە). (۲) [Slang]، بەندیخانە؛ زیندان

*v.t.* (۱) کردنە سوراحی، شووشە، یا لوولێنە.
(۲) لێنان یا کوڵاندن لە دەفرێکی سەرنراوەدا.
(۳) [Slang]، خستنە بەندیخانەوە.

**juggle** (jug′'l), *v.t.* (۱) یاری کردن بە تۆپ و چەقۆ و شتی وەها بە هەڵدانیان بە هەواداو گرتنەوەیان و هەڵدانەوەیان. (۲) جێ گۆڕکێ پێکردن؛ ئاڵوگوێز پێکردن؛ دەستکاری کردن بە نیازی خەڵەتاندن و سوودی خۆیی: *( The cashier ~ed the figures to show a profit.)*

*v.i.* هەڵدانی تۆپ و چەقۆ و شتی وەها بە هەواداو گرتنەوەیان و هەڵدانەوەیان بێ ئەوەی بکەونە سەر زەوی.

**juggler** (jug′lẽr), *n.* (١) کەسیك کە تۆپ‌و شتی وەها هەڵدەدات
بە هەواداو دەیان گرێتەوەو هەڵیان دەداتەوە هەر بۆ سەیر.
(٢) گزیکەر؛ فێڵباز؛ دەستکاری شت کەر بۆ مەبەستی تایبەتی خۆ.

**jugglery** (jug′lẽr-i), *n.* (١) هەڵدانی تۆپ‌و شتی وەها بە هەواداو
گرتنەوەیان‌و هەڵدانەوەیان هەر بۆ سەیر. (٢) فێڵبازی؛ گزی؛ خەڵەتاندن.

**jugular** (jug′yoo-lẽr, jōō′gyoo-lẽr), *adj.* (١) هی قوڕگ‌و مل.
(٢) هی دەماری قوڕگ‌و مل.

**jugular vein,** یەکێك لەو دوو دەمارەی مل کە خوێن لە سەرەوە دەبەنەوە
بۆ دڵ

**juice** (jōōs), *n.* (١) شیلە؛ شیرە؛ ئاووگ؛ خۆشاو؛ ئاو؛ ڕینگاو؛ تەڕی.
(٢) شلەی دەردراو لە لەشی گیاندارێك. (٣) ناوکرۆك؛ پوختە؛ ماك؛ گەوهەر.
(٤) [Slang]، ئەلەکتریك؛ کارەبا.
(٥) [Slang]، بەنزین؛ گاز؛ نەوت؛ سەرچاوەی وزە.

*v.t.* [Colloq.], شیلە لێ دەرهێنان؛ گوشین‌و خۆشاو لێ دەرهێنان.

**juicer** (jōō′sẽr), *n.* ئاوگر؛ گوشەر؛ ئامێری خۆشاو دەرهێنەر لە میوەو
سەوزە.

**juicy** (jōō′si), *adj.* (١) تەڕوبڕ؛ ئاودار؛ پڕ لە خۆشاو یا شیلە.
(٢) خۆش‌و سەرنج ڕاکێش‌و پیلاناوی (چیرۆك، نوکتە، قسەی پاش ملە):
*( a ~ story; ~ details)*
-juicily *(adv.)*; juiciness *(n.)*.

**jujitsu, jujutsu** (jōō-jit′sōō), *n.* زۆرانبازی یابانی.

**jujube** (jōō′jōōb), *n.* (١) عەنەب (٢) دار عەنەب. (٣) مرەبای عەنەب.

**juke box** (jōōk), [Colloq.], فۆنۆگراف یا سندووقی قەوانێکە لە
هەندێ چێشتخانەو مەیخانەدا بە پارەی وردە کار دەکات.

**July** (jōō-lī′), *n.* پووشپەڕ؛ مانگی تەمووز؛ میوەگەنان.

**jumbel** (jum′b'l), *v.t.* (١) تێکەڵ‌و پێکەڵ‌وکردن؛ شێواندن بەسەر
یەکدا؛ تێکەڵ کردن وەك چێشتی مجەوەر. (٢) سەر لێ شێواندن.

*v.i.* (١) تێکەڵ‌و پێکەڵ‌وبوون؛ بەسەریەکدا شێوان. (٢) سەر لێ شێوان.

*n.* (١) چێشتی مجەوەر؛ شتێکی تێکەڵ‌و پێکەڵ‌و؛ شتێکی بەسەریەکدا شێواو.
(٢) شێواوی؛ شێوان؛ سەر لێ شێواوی؛ شتێکی بێ سەروبن.

**jumbo** (jum′bō), *n.* کەسێك، گیاندارێك، یا شتێکی زل‌و قەبە.

*adj.* زل؛ زۆر زل؛ گەورە؛ قەبە.

**jump** (jump), *v.i.* (١) بازدان؛ قەڵەمبازدان؛ خۆهەڵدان؛ قونەکردن
(بۆق). (٢) هەڵبەزینەوە؛ ڕاتەکان.
(٣) هەڵ سڵەمینەوە؛ ڕاچڵەکین؛ داچڵەکین؛ ڕاپەڕین؛ ڕاچەنین:
*( to ~ at a loud voice)*
(٤) بازدان لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر
(٥) لەپڕ بەرزبوونەوە؛ زیادبوون لەپڕ: *( Prices have ~ed recently.)* .
(٦) بازدان بەسەرداو خواردن (داشی دامە).
(٧) پەلەکردن؛ بە پەلە گەیشتنە ئەنجام: *( to ~ to conclusions)* .

*v.t.* (١) بازدان بەسەردا.
(٢) باز پێدان؛ قەڵەمباز پێدان: *( He ~ed his horse over the fence.)*
(٣) (ا) بازدانە سەر یا ناو: *( to ~ a train, bus, etc.)* .
(ب) باز لێوەدان (٤) بەرزکردنەوە (نرخ)؛ زیادکردن (٥) بازدان (فیلم).
(٦) [Slang]، هەڵکوتانە سەر؛ پەلاماردان؛ شاڵاو بۆ بردن.
(٧) [Slang]، ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ لەپڕ بەجێهێشتن: *( He ~ed town.)* .
(٨) بەسەردا بازدان‌و خواردن (داشی دامە).
(٩) تەواوکردنی چیرۆك یا دەنگوباسێك لە لاپەڕەیەکی تردا (ڕۆژنامەگەری).

*n.* (١) باز؛ قەڵەمباز؛ قونە؛ هەڵبەزینەوە. (٢) ماوەی باز.
(٣) کۆسپ؛ قۆرت؛ شتێکی بەسەردا بازدراو.
(٤) گۆڕینێکی کوتوپڕ لە باسێکەوە بۆ باسێك: *( a ~ in the story)* .
(٥) بەرزبوونەوە یا زیادبوونی لەپڕ (نرخ): *( a ~ in prices)* .
(٦) هەڵ سڵەمینەوە؛ ڕاچڵەکین؛ فرتەفرت.
(٧) *(pl.)* ( the ~ ) ووڕێنەو لەرزین‌و فرتەفرت
(٨) ملەملێی بازدان (وەرزش): *( high ~ )*
(٩) بازدان بەسەراو خواردنی داشی دامە.
(١٠) دێڕێك کە بە خوێنەوار دەڵێت چیرۆکەکە لەسەر چی لاپەڕەیەك تەواو
دەکرێ (ڕۆژنامەگەری).

get ( or have ) the jump on, [Slang], دەستپێشکەری کردن؛
لە پێش هاوچاودا دەستپێکردن (ملەملێ، پێشبڕکێ).

jump at, (١) گەیشتنە ئەنجام بە پەلەو بێ لێکۆڵینەوەی تەواو.
(٢) بە پەرۆشەوە ڕازی بوون یا پەسەندکردن؛ قۆزینەوە:
*( to jump at an offer)*

jump bail, کەفالەت شکاندن؛ ڕاکردن‌و واز لە دەستەبەری هێنان.

jump on, [Slang], سەرزەنشت کردن؛ هێرش بردنە سەر بە دەم.

jump ship, پشت لێ هەڵکردن؛ بەجێهێشتن؛ دەستبەرداربوون؛
ڕاکردن لە ئەرك.

jump the gun, [Slang], (١) دەست بە ملەملێ کردن لە پێش نیشانە یا
فەرمانی دەستپێکردندا. (٢) پەلەکردن‌و دەستپێکردنی کارێك بەر لە کاتی خۆی.

jump the track, لەپڕ لە هێڵ لادان یا دەرپەڕین (شەمەندەفەر).

on the jump, [Colloq.], سەرقاڵ؛ هەمیشە خەریك

**jumper** (jum′pẽr), *n.* (١) بازدەر (مرۆڤ، شت).
(٢) گالیسکە بەفرینە؛ ئەسپە بەفرینە.
(٣) گیرە (کاتژمێر).
(٤) تەلی ئەلەکتریك پێ گەیاندن (خستنەکاری باترییەکی مردووی ئوتومبیلێك
بە بەستنی بە باترییەکی کارکەرەوە). (٥) پڕیاسکەگەیێن.
(٦) ئامێری کونکەر (کانگەری).

**jumper** (jum′pẽr), *n.* (١) چاکەتی کارگەرو کەشتییەوان (بۆ بە پاکی
ڕاگرتنی جلی ناوەوە). (٢) کراسی بێ قۆڵی ژنانە.
(٣) چاکەتێکی کڵاوداری فەرو.
(٤) جلی یەك پارچەی سەرتاپای یاری منداڵ

**jumpy** (jum′pi), *adj.* (١) (ا) هەڵبەزودابەزکەر؛ پڕ لە تاسە.
(ب) زوو زوو دەگۆڕێ؛ هەمیشە گۆڕاو. (٢) هەر لە خۆیەوە هەڵ دەسڵەمێتەوە
(لە ترسدا)؛ زوو هەڵدەچێت؛ زوو زوو دادەچڵەکێ؛ بە جرت‌وفرت
*( a ~ horse, guard, policeman, etc.)*

**junction** (juŋk′shən), *n.* (١) بەیەکگەیشتن؛ بەیەکگەیاندن؛ لێکدان.
(٢) شوێنی بەیەکگەیشتن (٣) چوار ڕێیان؛ دووڕیانە.

**juncture** (juŋk′chẽr), *n.* (١) بەیەکگەیشتن؛ بەیەکگەیاندن؛ لێکدان.
(٢) جەمسەر. (٣) کاتێکی تایبەتی: *( at this ~ )* .
(٤) تەنگ‌وچەڵەمە؛ کاتی تەنگ‌وچەڵەمە. (٥) بار؛ دۆخ.

**June** (jōōn), *n.* جۆزەردان؛ باران بڕان.

**jungle** (juŋ′g'l), *n.* (١) بێشەڵان؛ بێشە؛ دارستانێکی چڕی پڕ دڕندە.
(٢) چڕستان؛ شوێنێکی پڕ لە پووەك‌و دارو درەخت.
(٣) [Slang]، نیشتەجێی خەڵکی بێ لانەو دەربەدەر.

**junior** (joon′yẽr), *n.* (١) کوڕ یا بچووك (نازناوی کوڕێکە کە ناوی وەك
هی باوکی وەها بێت): *( John Brown, J~ .)* .
(٢) پلە کەمتر؛ پلە نزمتر؛ پلە نزم: *( a ~ partner, officer, etc.)*
(٣) تازەتر؛ نوێ تر؛ لە دواوەتر. (٤) تایبەتی بە قوتابی پۆلی سێهەم یا پۆلی
سێهەمی کۆلیج، زانکۆ، یا قوتابخانەی ئامادەیی.

*n.* (١) کەسێکی گەنج یا منداڵ؛ لاو. (٢) کەسێکی پلە نزمتر؛ کەسێکی پلە نزم.
(٣) قوتابی پۆلی سێهەمی کۆلیج، زانکۆ، یا قوتابخانەی ئامادەیی

one's junior, کەسێکی لە خۆ گەنجتر؛ کەسێکی لە خۆ منداڵتر.

**junior college,** کۆلیج یا دانشگای دووساڵەیی پاش قوتابخانەی
ئامادەیی (کە بەرامبەر بە دوو ساڵی یەکەمی زانکۆ یا کۆلیجی چوارساڵەیە).

**junior high school,** قوتابخانەی ناوەندی (کە بریتییە لە پۆلی
حەوت‌و هەشت‌و نۆ، واتە سێ پۆل دوای قوتابخانەی سەرەتایی).

**juniper** (jōō′nə-pẽr), *n.* عەرعەر؛ دار عەرعەر.

**junk** (juŋk), *n.* (١) شڕە؛ کۆنە؛ پڕوپیت؛ خەڕەکە شکاو.
(٢) [Colloq.]، شتێکی بێ نرخ؛ خڵتە؛ شتێك کە هەر بۆ فڕێدان بشێت.
(٣) قاوورمە.

*v.t.* [Colloq.]. فرێدانی شتی کۆنەو بەکەلك نەماو: ***( He ~ed his car.)*** .

**junk** (juŋk), ***n.*** کەشتییەکی بابەوانی چینی

**junket** (juŋ′kit), ***n.*** (١) محەللەبی؛ پەنیری شیرین

(٢) سەیران؛ ئاهەنگێك بە ئانخواردنەوە. (٣) گەشت

(٤) گەشتی کاربەدەستێك لەسەر حسابی میری.

*v.i.* گەشتکردن لەلایەن کاربەدەستێکەوە لەسەر حسابی میری.

*v.t.* میوانداری کردن لە سەیران یا ئاهەنگێکدا.

**junkie** (juŋki), ***n.*** [Slang]. حەشیشەخۆر؛ هیرۆین خۆر.

**junkman** (juŋk′man′), ***n.*** کۆنەفرۆش

**junkyard** (juŋk′yärd′), ***n.*** کۆنەخانە؛ کۆنەخانەی ئوتومبیل.

**junta** (jun′tə), ***n.*** (١) ئەنجومەن یا لیژنەی رامیاری و کارگێری

(بەتایبەتی دەستەیەك کە جڵەوی وڵات دەگرنە دەست پاش رووخاندنی میری).

(٢) دەستەیەکی پیلانگێر.

**junto** (jun′tō), ***n.*** دەستەیەکی پیلانگێر

**Jupiter** (jōō′pə-tër), ***n.*** (١) گەورەخودای رۆمانەکان (ئەفسانەی

رۆمانی) (٢) جوپیتەر: گەورەترین ئەستێرەی کاروانکەرو پێنجەمین

لە دوورییدا لە رۆژەوە؛ موشتەری

**jural** (joor′əl), ***adj.*** (١) دادی؛ دادگەری

(٢) تایبەتی بە ماف و ئەرکی سەرشان.

**jurant** (joor′ənt), ***n.*** سوێندخۆر (دادگەری).

**jurat** (joor′at), ***n.*** (١) [Obs.]. کەسێکی سوێندراو (دادگەری)

(٢) دادپرس (٣) بروانامەیەکە دەنووسێتریّ بە شایەتییەکەوە روونی دەکاتەوە

کەی و لە کوێ و لە بەردەمی کێدا ئەم شایەتییە دراوە.

**juridic, juridical** (joo-rid′ik, joo-rid′i-k'l), ***adj.*** دادگەری؛

تایبەتی بە دادگەری و داواو رووداو و کاروباری دادگا.

**jurisconsult** (joor′is-kən-sult′, joor′is-kon′sult), ***n.*** زانای

دادگەری؛ دادگەر؛ یاسازان

**jurisdiction** (joor′is-dik′shən), ***n.*** (١) دادپرسین؛ دادپرسی؛

ماف و دەسەڵاتی دادپرسین؛ دادگەری. (٢) دەسەڵات؛ دەسەڵاتداری:

***( A country's courts have ~ not only over its own citizens but over foreigners who are living in the country.)***

(٣) رادەی دەسەڵات یا دەسەڵاتداری.

(٤) سنوورو مەودای دەسەڵاتداری؛ بەش کردنی دەسەڵات بەگوێرەی ناوچە.

(٥) دادگا

**jurisprudence** (joor′is-prōō′d'ns), ***n.*** (١) فەلسەفەو زانستی

یاساو یاسادانان؛ فەلسەفەو زانستی دادگەری.

(٢) کۆمەڵێك یاسا؛ سەرجەمی یاسا. (٣) لقێك لە یاسا یا داگەری.

**jurisprudent** (joor′is-proo′d'nt), ***n.*** = jurist.

**jurist** (joor′ist), ***n.*** زانای یاسا؛ یاسازان؛ دادگەر.

**juristic** (joo-ris′tik), ***adj.*** تایبەتی بە یاساو یاسازانی؛

تایبەتی بە دادگەری

**juror** (joor′ër), ***n.*** (١) سوێندخۆر یەکێك لەو دوانزە کەسەی کە دادگاو

پارێزەری گومانبارێك هەڵیان دەبژێرن بۆ بڕیاردانی تاوانباری یا بێ تاوانی

گومانبارەکە (٢) سەرپشك؛ ئەندامی دەستەیەکی سەرپشکی (مەلەملێ،

کێ بڕکێ).

**jury** (joor′i), ***n.*** (١) دەستەی سوێندخواران. بریتییە لەو دوانزە کەسەی

کە دادگاو پارێزەری گومانبارێك هەڵیان دەبژێرن بۆ بڕیاردانی تاوانباری یا

بێ تاوانی ئەو گومانبارە. (٢) دەستەی سەرپشك (مەلەملێ، کێ بڕکێ).

**jury** (joor′i), ***adj.*** هی بەکارهێنانی سەرەدەمی لەسەر کەشتییەك

***( a ~ mast)***

**juryman** (joor′i-mən), ***n.*** = juror.

**just** (just), ***adj.*** (١) رەوا؛ هەق؛ بێ لایەن: ***( a ~ decision)*** .

(٢) دادپەروەر؛ دادپەرست؛ هەق پەرست: ***( a ~ man)*** .

(٣) شایستە؛ هەقی خۆیەتی؛ رەوا: ***( a ~ punishment)*** .

(٤) بەجێ؛ شیاو.

(٥) لە جێی خۆیایەتی؛ بێ هۆ یا بنچینە نییە: ***( a ~ suspicion)*** .

(٦) راست. (٧) تەواو؛ دەقاودەق.

*adv.* (١) بە تەواوی؛ بێ کەم و زیاد: ***( ~ one o'clock)*** .

(٢) نزیکەی. (٣) تەنها؛ هەر: ***( ~ a simple soul)*** .

(٤) بە ئاستەم؛ تەنها بە تۆزێك: ***( He ~ missed the train.)*** .

(٥) هەر ئێستا؛ تازە: ***( She has ~ left.)*** .

(٦) [Colloq.]. زۆر؛ ئێجگار؛ بە راستی: ***( It's ~ beautiful.)*** .

**just now,** هەر ئێستا؛ پێش هەناسەیەك.

**just the same,** [Colloq.], لەگەڵ ئەوەشدا.

**justice** (jus′tis), ***n.*** (١) دادپەروەری؛ دادپەرستی؛ داد؛ هەق پەرستی؛

هەق. (٢) سەرڕاستی؛ راستی.

(٣) رەوایی (مەسەلەیەك): ***( the ~ of our cause)*** .

(٤) پاداشت یا سزای شایستە (٥) دادگەری؛ دادپرسی. (٦) دادپرس؛ دادگەر.

**bring to justice,** دان بە دادگا بۆ سزای رەوای خۆ وەرگرتن.

**do justice to,** (١) بە رەوا لەگەڵ جووڵانەوە؛ مافی خۆ پێدان.

(٢) نرخ زانین؛ نرخی خۆ پێدان؛ بایەخی خۆ پێدان:

***( to do justice to the occasion)***

**do oneself justice,** بایەخ بە خۆ دان؛ ماف بە خۆ دان؛

خۆ بێ ماف نەکردن.

**justice of the peace,** دادپرسی ناوبژی کردن.

**justiceship** (jus′tis-ship′), ***n.*** دادگەرێتی؛ پلەو فەرمان و ماوەی

لەسەر کار مانەوەی دادپرس.

**justiciable** (jus-tish′i-ə-b'l), ***adj.*** (١) دەتوانرێ بدرێ بە دادگا.

(٢) لە سنووری دەسەڵاتی دادگادایە.

**justifiable** (jus′tə-fī′ə-b'l), ***adj.*** بەڵگەدار؛ رەوا؛ هەق؛

بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە: ***( His anger is ~.; ~ homicide)*** .

-justifiability ***(n.)***; justifiably ***(adv.)***.

**justification** (jus′tə-fi-kā′shən), ***n.*** (١) بەڵگە؛ بیانوو؛

بروبیانوو: ***( One can find ~ for any act he commits.; His ~ for stealing was that his children were hungry.)***

(٢) بەڵگە یا بیانوو هێنانەوە.

(٣) بێ تاوانی.

**justify** (jus′tə-fī′), ***v.t.*** (١) بەڵگە هێنانەوە؛ بە رەوا پیشاندان؛

بروبیانوو دۆزینەوە. (٢) بەخشین؛ ئازادکردن؛ بڕیاری بێ تاوانی دان.

(٣) هێنان؛ شایستەبوون: ***( Does anything ~ taking a life?)***

(٤) چاك کردن و رێکخستنی تیپ (چاپەمەنی).

*v.i.* (١) بە رەوا پیشاندان؛ بەڵگە هێنانەوە.

(٢) سەلماندنی شیانی کەسێك بۆ بوون بە دەستەبەر.

(٣) رێزکردن و رێکخستنی تیپ (چاپەمەنی).

**justly** (just′li), ***adv.*** بە هەق؛ بە رەوا.

**jut** (jut), ***v.i.*** سەردەرهێنان؛ دەرپەڕین:

***( He saw a gun ~ting out of some bushes.)***

***n.*** چوکڵە؛ نووك؛ سەر.

**Jute** (jōōt), ***n.*** ئەندامی تیرەیەکی ئەڵمانی کە لە سەدەی پێنجەمدا

ئینگلتەرەیان داگیرکرد.

**jute** (jōōt), ***n.*** (١) گوش: ریشاڵێکە گونیەو پەتی گوشین و شتی وای

لێ دروست دەکرێت. (٢) رووەکێکە ئەم جۆرە ریشاڵەی لێ دەردەهێنرێ.

***adj.*** گوشین؛ گوشی.

**jutty** (jut′i), ***n.*** (١) بەشێکی دەرپەڕیو یا سەردەرهێنەری دیوارێك یا

خانوویەك. (٢) ئەسکەلە؛ دیواری بەربەستکەری بەرزاوی دەریا (بۆ پاراستنی

بەندەرێك یا کەناری دەریاکە).

*v.i. & v.t.* دەرپەڕین؛ سەر هێنانە دەرەوە.

**juvenescence** (jōō′və-nes′'ns), ***n.*** گەنج بوونەوە.

**juvenile** (jōō′və-n'l, jōō′və-nīl′), ***adj.*** (١) منداڵ؛ گەنج.

(٢) منداڵانە؛ هی منداڵ؛ گەنجی؛ هەرزانە.

*n.* (١) منداڵ؛ منداڵێك؛ هەرزە. (٢) ئەكتەرێك كە دەوری گەنج دەبینێ.
(٣) كتێبی منداڵان.

**juvenile court,** دادگای منداڵان؛ دادگای هەرزە (لە هەژدە ساڵ كەمتر).

**juvenile delinquent,** تاوانبارێكی منداڵ؛ تاوانبارێكی گەنج یا هەرزە (لە هەژدە ساڵ كەمتر).

**juvenilia** (joo´və-nil′i-ə, jōō´və-nil′yə), ***n.pl.*** بەرهەمی منداڵی یا گەنجی (نووسین، وێنەكێشی)؛ كرداری منداڵی یا گەنجی.

**juvenility** (jōō´və-nil′ə-ti), ***n.*** (١) منداڵێتی؛ هەرزەیی.
(٢) كردەوە یا ڕەوشتێكی منداڵانە. (٣) منداڵان؛ هەرزەكاران.

**juxtapose** (juks′tə-pōz´), ***v.t.*** خستنەپاڵ یەكتری (بەتایبەتی بۆ بەراووردكردن)؛ لە لای یەكەوە دانان.

**juxtaposition** (juks´tə-pə-zish′ən), ***n.*** (١) خرانەپاڵ یەكتری (بۆ بەراووردكردن)؛ لە لای یەكەوە دانران: ***( the ~ of ideas)*** .
(٢) لە لای یەكەوە بوون.

# K k

**K, k** (kā), *n.* (١) تیپی یانزەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە
(٢) دەنگی ئەم تیپە "کەی" (٣) نیشانەی یانزەهەم لە ریزێکدا.
*adj.* (١) تایبەتی بەم تیپە (٢) یانزەهەم
**K** (kā), *n.* (١) شتێك لە شێوەی تیپی " **k** " دا.
(٢) ژمارە ٢٥٠٠ی رۆمانی. (٣) نیشانەی ژمارەی نەگۆڕ (بیرکاری).
*adj.* شێوەی وەك " **k** " وایە.
**Kaaba** (kä′bə, kä′ə-bə), *n.* کەعبە
**Kabuki** (kə-bōō′kē), *n.* کابوکی جۆرە شانۆگەرییەکی یابانیییە
بە سەدەی گۆرانییەوە.
**kaiser** (kī′zēr), *n.* قەیسەر؛ ئیمپراتۆر؛ شاهەنشا؛ نازناوی
فەرمانڕەواکانی ئیمپراتۆرنشینی رۆمانی پیرۆزو نەمساو ئەڵمانیا.
**kaka** (kä′kə), *n.* تووتییەکی نیوزیلەندییە.
**kakapo** (kä′kä-pō′), *n.* تووتییەکی زەمین نشینی شەوینی
نیوزیلەندییە
**kale** (kāl), *n.* (١) سەوزەیەکە وەك کەلەرم وەهایە
(٢) شۆربا یا شلەی ئەم سەوزەیە. (٣) [Slang]، پارە (بەتایبەتی هی کاغەز).
**kaleidoscope** (kə-lī′də-skōp′), *n.* (١) ئامێرێکی لوولەکییە
پارچە شووشەی هەمە شێوەو ئەندازەو رەنگو نەقشی تێدایەو ئەم شێوەو
رەنگو نەقشە دەگۆڕێ بە هی تر بە بادانی ئامێرەکە.
(٢) شتێکی هەمیشە گۆڕ (بەتایبەتی لە رەنگو نەخشەدا)
-kaleidoscopic *(adj.)*; kaleidoscopically *(adv.)*.
**kangaroo** (kaŋ′gə-rōō′), *n.* کەنگەر گیاندارێکی ئوستورالییە.
بە قەلبەز قەلبەز دەرواتو بەچکەکەی لە کیسەیەکدا هەڵدەگرێ لەبەرخۆیەوە.
**kangaroo court**, [Colloq.]. دادگایەکی بێ دادی دادگایەکی
هەرەمەکییە کە لەسەر یاساو دەستوور ناروات.
**kaput** (kə-pōōt′), *adj.* [Colloq.]. فەوتاو؛ پەك کەوتوو؛ شکاو؛
بەکەڵك نەماو
**karat** (kar′ət), *n.* = carat.
**karate** (kä-rä′tē), *n.* کاراتی واتە " بە دەستی خاڵی " جۆرە
خۆپاراستنێکی بێ چەکی یابانیییە بریتییە لە هەڵ هێنانو لە دوژمن دان
بە لای دەست
**karma** (kär′mə, kūr′mə), *n.* (١) کارمە: سەرجەمی کردارو
رەووشتی کەسێك لە یەکێك لە ژیانەکانیدا یا لە چەرخێکی ژیانیدا کە کاردەکاتە
سەر چارەنووسی لە ژیانەکانی تریدا یا لە چەرخەکانی تری ژیانیدا (ئاینی
بوودی و هیندی). (٢) چارەنووس.

**katharsis** (kə-thär′sis), *n.* = catharsis.
**kayak** (kī′ak), *n.* بەلەمی سەرداپۆشراوی ئەسکیمۆیی.
**keel** (kēl), *n.* (١) ئیرکە یا شێلمانی ژێر بەلەمو کەشتی بە درێژی.
(٢) [Poetic]، کەشتی. (٣) سەرجەمی شیشی ژێر فڕۆکە (بۆ دانەکەوتنی
بنەکەی). (٤) تیرەغەی بەرسنگی باڵندە.
*v.t.* (١) ئیرکە یا شێلمان خستنە ژێر.
(٢) هەڵگەڕاندنەوەی کەشتییەك بۆ سەر لایەکی.
keel over, [Colloq.], (١) هەڵگەڕاندنەوە؛ وەرگەڕاندن.
(٢) کەوتن؛ بوورانەوەو کەوتن.
on an even keel, (١) بە رێکی؛ راست؛ بەبێ کەوتن یا خواربوونەوە
بەملاو بەولادا. (٢) بە بێ هەڵبەزو دابەز؛ بە رێكو رەوانی:
*( to stay on an even keel)*
**keel** (kēl), *n.* (١) کەشتییەکی بن تەخت (بەتایبەتی هی خەڵووز
گواستنەوە)؛ باریجەی خەڵووز. (٢) بارە خەڵووزی کەشتی یا باریجەیەکی وەها.
(٣) کێشانەیەکی ئینگلیزی خەڵووزە بریتییە لە بیستو یەك تەن
**keel** (kēl), *n.* بۆیەیەکی سوورە.
**keen** (kēn), *adj.* (١) تیژ: *( a ~ knife, edge, etc.)*.
(٢) تیژ؛ بڕ: *( a ~ appetite, wind, etc.)*.
(٣) تیژ؛ ووریا؛ زیرەك؛ رێ بەدیکەر: *( ~ eyes; a ~ mind)*
(٤) زۆرزان.
(٥) سوور لەسەر؛ هەوەس لەسەر؛ بۆ بە جۆش:
*( to be ~ on doing something)*
(٦) توندوتیژ. (٧) [Slang]، زۆر باش؛ نایاب.
**keen** (kēn), *n.* شیوەن؛ واوەیلێ.
*v.t. & v.i.* شیوەن کردن؛ واوەیلێ کردن.
**keep** (kēp), *v.t.* (١) پەیرەوی کردن (نەریتێك وەك کار نەکردن لە
رۆژی هەینیدا): *( They kept the Sabbath.)*.
(٢) (ا) پاراستن. (ب) ئاگاداری کردن؛ چاو تێوەبوون (بۆ ئاگاداری).
(ج) هێشتنەوە بە باشیو رێکوپێکی. (د) ژیاندن؛ بەخێوکردن؛ یارمەتیدان
(هـ) خواردن پێدان یا جێکردنەوە بە پارە؛ بەخێوکردن بە پارە:
*( She ~s boarders.)*
(و) راگرتن (بەردەست): *( They ~ servants.)*.
(ز) دەفتەرگرتن: *( to ~ books for a business firm)*.
(ح) تۆمارکردن (یادداشت)؛ نووسین هەموو رۆژ: *( She ~s a diary.)*.
(٣) بەرێوەبردن.
(٤) بەردەوام بوون لەسەر؛ راگرتن لە باری خۆیدا:
*( ~ your engine running.)*
(٥) هەڵگرتن بۆ دواڕۆژ یا بۆ ماوەیەکی زۆر.
(٦) هەبوون (لە فرۆشگادا)
(٧) (ا) گرتن (بەندیخانە)؛ بەستنەوە. (ب) گلدانەوە؛ راگیرکردن
(ج) رێ لێگرتن: *( The rain kept us from going out.)*.
(د) پێ نەدان
(هـ) هەڵگرتن بۆ خۆ: *( She kept the change.)*.
(و) لێ شاردنەوە (دەنگوباس): *( He kept the news from her.)*
(ز) دەست لێ هەڵنەگرتن.
(ح) مانەوە لەسەر رێبازێك یا لە شوێنێك؛ لە رێ لانەدان.
*v.i.* (١) بەردەوام بوون؛ مانەوە لەسەر باری خۆ، جێگە، رێباز، هتد...
(٢) ( ~ on ) کۆڵ نەدان؛ واز نەهێنان؛ بەردەوام بوون لەسەر:
*( to ~ on talking)*
(٣) خۆ راگرتن؛ رێ بە خۆ نەدان: *( She can't ~ from telling us.)*
(٤) نەفەوتان؛ مانەوە بە رێکوپێکی و باشی؛ بۆگەن نەکردن:
*( The food will ~ .)*
(٥) [Colloq.]، بە کراوەیی مانەوە؛ بەردەوام بوونی کۆڕ گرتن:
*( Will school ~ all day?)*
(٦) [Colloq.]، نیشتەجێی شوێنێك بوون؛ ژیان لە شوێنێکدا.

*n.* (١) چاودیری؛ ئاگا لێ بوون؛ سەرپەرشتی؛ پاراستن.
(٢) (ا) قەلا؛ سەنگەر. (ب) ناوجەرگەی قەلا؛ قوللەی ناوقەلا.
(٣) [Rare]، بەخێوکردن؛ ژیاندن.
(٤) خۆراک؛ خواردەمەنی؛ بژێو: *( The horse isn't worth its ~ .)*.
**for keeps, [Colloq.],** (١) شتە براوەکە هەڵ دەگری بۆ خۆی
(٢) هەتا هەتا
**keep at,** بەردەوام بوون لەسەر.
**keep down,** (١) کەمکردنەوە (خەرجی)؛ بە کەمی هێشتنەوە.
(٢) کەمکردنەوە (دەنگ)؛ کپ کردنەوە. (٣) ڕێی پەرەسەندن لێگرتن.
**keep in with,** پەیوەندی بە باشی مانەوە لەگەڵدا؛
بە برادەرێتی مانەوە لەگەڵ.
**keep off,** (١) لێ دوورکەوتنەوە؛ لە دوورەوە وەستان.
(٢) بەرهەڵستی کردن؛ لە دوورەوە ڕاگرتن.
**keep on,** بەردەوام بوون لەسەر؛ سووربوون لەسەر؛ دەست هەڵنەگرتن.
**keep out,** لێ دوورکەوتنەوە؛ هەق بەسەرەوە نەبوون
**keep to oneself,** (١) گۆشەگیری کردن؛ بە تەنهایی ژیان.
(٢) بە کەس نەووتن (دەنگوباس)؛ شاردنەوە.
**keep up,** (١) بە باشی ڕاگرتن؛ پاراستن. (٢) بەردەوام بوون لەسەر.
(٣) بڕکردن لەگەڵدا؛ لەگەڵدا دەرچوون؛ دوا نەکەوتن.
(٤) ( ~ with )، بە ئاگاداری مانەوە.
**keep up with,** دوا نەکەوتن؛ بڕکردن لەگەڵدا؛ لەگەڵ دەرچوون؛
پیاگەیشتن

**keeper** (kēp′ēr), *n.* (١) بەندیوان؛ پاسەوانی بەندیخانە.
(٢) پاسەوانی باڵندەو گیاندار (وەك لە باخچەی گیانداراندا).
(٣) پارێزگار؛ چاودێریکەر.
(٤) خاوەن *( shopkeeper, innkeeper)*
(٥) گیرە ئامێن

**keeping** (kēp′iŋ), *n.* (١) پەیڕەوی کردن؛ ڕاگرتن و نەشکاندن (بەڵێن).
(٢) سەرپەرشتی؛ ئاگا لێ بوون؛ پاراستن. (٣) بەخێوکردن.
(٤) دۆخ. (٥) هێشتنەوە.
(٦) هەڵگرتن و پاراستن بۆ دواڕۆژ.
(٧) گونجان: *( His acts are not in ~ with his promises.)*.

**keepsake** (kēp′sāk′), *n.* یادگار؛ شتێك کە هەڵ دەگیرێ یا
دەبەخشرێت بۆ یادگار.

**kef** (kāf), *n.* (١) کەیف؛ سەرخۆشی (لە بەنگ کێشانەوە). (٢) بەنگ.

**keg** (keg), *n.* (١) بەرمیلێکی بچووکە (دە گالۆن دەگرێ).
(٢) کێشانەیەکی بزمارە (سەد پاوەنە)

**kelp** (kelp), *n.* (١) گیای دەریا (گەڵا پان و بۆرە).
(٢) خۆڵەمێشی ئەم گیایە (یۆدی لێ دەردەهێنرێت).

**ken** (ken), *v.t.* (١) [Scot.]، زانین.
(٢) [Archaic]، بینین؛ سەیرکردن.
*v.i.* [Scot.], پێ زانین؛ لێ زانین.
*n.* (١) [Rare]، بینین؛ ماوەی چاو بڕکردن؛ بینایی.
(٢) هەستپێکردن؛ زانین؛ مەودای زانین یا ڕێ بەدیی کردن.

**kennel** (ken′'l), *n.* (١) کولانە سەگ
(٢) (*pl.*) جێی زاوزێ پێ کردن و بەخێوکردنی سەگ. (٣) گەلە سەگ.
*v.t.* خستنە کولانە سەگەوە
*v.i.* لە کولانە سەگدا ژیان.

**kennel** (ken′'l), *n.* زێرابی سەر بەرەلا؛ ئاوەڕۆکە

**kenning** (ken′iŋ), *n.* (١) [Scot.]، (ا) زانیاری؛ زانین. (ب) ئەخت.
(٢) ناوی مەجازی شتێك لە هۆنراوەدا (وەك: sea-stead بەمانای: ship ).

**kept** (kept), *past tense and past participle of* **keep.**

**keratin** (ker′ə-tin), *n.* ئەو ماددەیەیە لە لەشدا کە شاخ و نینۆك و قژو
سمی لێ دروست دەبێ

**keratosis** (ker′ə-tō′sis), *n.* مێخەکە

**kerchief** (kūr′chif), *n.* (١) سەرپۆش. (٢) دەسەسڕ.

**kern** (kūrn), *n.* نووکی تیپێکی چاپ.

**kern, kerne** (kūrn), *n.* (١) [Archaic]، سەربازێکی پیادەی کۆنی
ئێرلەندی یا ئوسکوتلەندی. (٢) وەرزێرێکی ئێرلەندی

**kernel** (kūr′n'l), *n.* (١) دەنك (گەنم، جۆ، برنج، هتد...)؛ تۆو.
(٢) کاکڵ. (٣) ناوکرۆك؛ گەوهەر؛ ماك.

**kerosene** (ker′ə-sēn′, ker′ə-sēn′), *n.* نەوت.

**ketchup** (kech′əp), *n. Also* **catsup, catchup,** دۆشاوی تەماتە
بە بەهاراتەوە.

**kettle** (ket′'l), *n.* (١) کتلی؛ کتری چا.
(٢) تەپڵ (کە بنەکەی ئاسن بێ و سەرەکەی چەرم).
(٣) چاڵە قووتە؛ چاڵ. (٤) چاڵە قووتەی ناو شاخێکی سەهۆڵین
**kettle of fish,** کاروبارێکی ناقۆڵا؛ بارێکی ناقۆڵاو گیروگرفتاری ناخۆش.

**kettledrum** (ket′'l-drum′), *n.* تەپڵێکی بن ئاسن و سەر چەرم.

**key** (kē), *n.* (١) کلیل. (٢) (ا) کلیلی کاتژمێر. (ب) دەمبووس، بزمار، یا
کێلونێك کە دەخرێتە کونێکەوەو شتێکی پێ قایم دەکرێ یا دادەخرێ.
(ج) شتێك کە دوو شت پێکەوە ڕاگیر دەکات (وەك بەردی سەر تاق).
(د) دوگمەی پیانۆ یا تیپنووس.
(٣) شتێك کە وەك کلیل بکاتەوەو دابخات بەتایبەتی: (ا) دەرگای ناوچەیەك.
(ب) نەخشە یا کلیلی لێکدەرەوە (دەنگبێژی)؛
نووسراوی سەر نەخشەیەك کە نەخشەکە لێکدەداتەوە.
(ج) کەسێك یا شتێکی زۆر گرنگ (بۆ جێبەجێکردنی کارێك).
(٤) دەنگ؛ بەرزونزمی دەنگێك
(٥) شێوازی دەربڕین و نووسین و بیرکردنەوە:
*( He wrote and spoke in a cheerful ~ .)*
(٦) سەرجەمی ئاوازی پارچەیەك مۆسیقا.
*adj.* زۆر گرنگ؛ گرنگ:
*( a ~ industry; He has a ~ position in the government.)*
*v.t.* (١) داخستن بە کلیل یا کێلوون؛ کلیل دان.
(٢) (ا) بەردی تەوقەسەری تاق دانان. (ب) نەخشە یا کلیلی لێکدانەوە بۆ دانان
(٣) ڕێکخستنی بەرزی و نزمی دەنگ یا ئاواز.
(٤) گونجاندن؛ یەکخستن؛ یەك دان کردن.
**key up,** (١) بەرزکردنەوە (دەنگ، ئاوان).
(٢) وورووژاندن؛ خستنە جۆش؛ بزواندن.

**key** (kē), *n.* دوورگەیەکی نزم؛ تیرە بەرد یا لمێك کە لە ئاستی ئاودا بێت یا
نەختێك لە ژێر لە ژووری ئاستی ئاوەکەوە بێت.

**keyboard** (kē′bôrd′, kē′bōrd′), *n.* کلیل بەند (پیانۆ، تیپنووس)

**keyed** (kēd), *adj.* (١) کلیل یا دوگمەدار (ئامێری مۆسیقا).
(٢) کلیل دراو؛ کێلوون دراو.
(٣) بەرزی و نزمی لە پلەیەکی تایبەتیدا دانراوە (دەنگ، ئاوان).

**keyhole** (kē′hōl′), *n.* کونە کلیلی دەرگا؛ کونە قفڵ.

**keynote** (kē′nōt′), *n.* (١) نزمترین دەنگی ئاوازێکی مۆسیقا؛
ئاوازی بناغە. (٢) بنچینەی ووتارێك یا ڕێبازێك؛ بیروباوەڕی هەرە گرنگ.
*v.t.* سەرووتار خوێندنەوە؛ بنچینە یا بیروباوەڕی هەرە گرنگی ووتارێك یا
نەخشەیەك پێشکەش کردن.

**keynoter** (kē′nōt′ēr), *n.* سەرووتار خوێنەرەوەی کۆنگرەیەك یا
کۆڕێك

**keynote address** *or* **speech,** سەرووتاری کۆنگرەیەك یا کۆڕێك؛
ووتاری سەرەکی کۆنگرەیەك یا ئاهەنگێکی ڕەسمی.

**keystone** (kē′stōn′), *n.* (١) بەردی سەرتاق (کە هەردوو لای تاقەکە
پێکەوە ڕادەگرێ). (٢) بەردی بناغە؛ گرنگترین بەش یا پارچە

**khaki** (kak′i, kä′ki), *adj.* (١) خاکی؛ بۆر
(٢) لە قوماشی خاکی دروستکراو
*n.* (١) خاکی؛ ڕەنگی خاکی (٢) جل و بەرگ یا قوماشی خاکی.

**khan** (kän, kan), *n.* خان (نازناو).

**khan** (kän, kan), *n.* خان؛ کاروان سەرا.
**kibbutz** (ki-bōōts′), *n.* ئاوایییەکی هەرەوەزی کشتوکاڵی جوولەکەیە.
**kibitzer** (kib′it-sēr), *n.* [Colloq.], (١) کەسێك کە لە لای یاریکی قومارچییەوە دادەنیشێ و خۆی هەڵ دەقورتێنێتە یارییەکە.
(٢) خۆتێهەڵقورتێنەر.
**kick** (kik), *v.i.* (١) (ا) شەق تێهەڵدان؛ تێهەڵدان (ب) لەقەدان؛ جووتەدان؛ جووتە وەشاندن. (٢) بە توندی گەڕانەوە بۆ دواوە (چەکی ئاگرین پاش تەقاندنی). (٣) [Colloq.]، بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵا کردن.
*v.t.* (١) (ا) شەق تێهەڵدان؛ تێهەڵدان؛ لە تۆپ هەڵدان. (ب) جووتەلێدان؛ لەقەلێدان. (٢) بە توندی گەڕانەوە بۆ دواوە (چەکی ئاگرین پاش تەقاندنی).
(٣) بە شەق یا بە زۆر ڕێ بۆ خۆ کردنەوە. (٤) گۆڵ کردن (یاری تۆپ تۆپێن).
(٥) [Colloq.]، خوو تەرك کردن (جگەرە کێشان، خواردنەوە، هتد...):
*( He ~ the habit.)*
*n.* (١) (ا) شەق (ب) شەق تێهەڵدان. (ج) لەقە؛ جووتە.
(٢) گەڕانەوە بۆ دواوە بە توندی (چەکی ئاگرین پاش تەقاندنی).
(٣) [Colloq.]، بۆڵەبۆڵ؛ سکاڵا.
(٤) [Colloq.]، خۆشی؛ کەیف: *( to get a ~ out of something)*.
(٥) (ا) شەق لە تۆپ هەڵدان؛ شەقێکی وەها (ب) تۆپی شەق لێدراو.
(ج) ماوەی بڕکردنی شەق یا تۆپی شەق لێدراو
(د) نۆبەی شەق لە تۆپ هەڵدان
**kick around ( or about ), [Colloq.],** (١) شەق شەقێن پێکردن؛ بە ناشرینانە لەگەڵ جوولانەوە
(٢) گوێزانەوە؛ گواستنەوە لەم شوێن بۆ ئەو شوێن.
(٣) باس کردن؛ لێکۆڵینەوە: *( to kick an idea around)*.
**kick back,** (١) [Colloq.]. لەپڕ یا لە ناکاو گەڕانەوە بۆ دواوە یا هەڵبەزینەوە (چەکی ئاگرین پاش تەقاندنی). (٢) [Slang]، (ا) شتی دزراو دانەوە بە خاوەنەکەی. (ب) بەرتیل پێدان (بەتایبەتی بەش کردنی هەندێ لەو پارە، بەرتیل، قازانج، مووچە یا بەخشیشەی کە دەستکەوتووە لە ڕێی چەوتەوە لەگەڵ کەسێك یا چەند کەسێکی تردا).
**kick off,** (١) شەق لە تۆپ هەڵدان بۆ یەکەم جارو دەست بە یاری کردن.
(٢) دەستپێکردن *( to kick off a political campaign)*.
(٣) [Slang]، مردن.
**kick one's heels,** کات بەفیڕۆ دان بە چاوەڕێ کردنی بێ سوود
**kick out,** (١) [Colloq.] دەرکردن؛ کردنە دەرەوە
(٢) تۆپ لە یاریگا کردنە دەرەوە بە شەقی قایم.
**kick the bucket, [Slang],** مردن
**kick up one's heels,** کاتێکی خۆش بردنە سەر؛ ڕابواردن؛ کەیف کردن (بەتایبەتی پاش کارێکی ووشك و ناخۆش).
**kikback** (kik′bak′), *n.* (١) (ا) گەڕانەوە بۆ دواوە لەپڕو بە قایم (چەکی ئاگرین پاش تەقاندنی). (ب) ئەنجامێکی توندوتیژ.
(٢) [Slang]، (ا) بەرتیل (بەتایبەتی ئەو بەرتیل، بەخشیش، قازانج، یا مووچەیەی کە دەستکەوتووە لە ڕێی چەوتەوەو بەش دەکرێ لەگەڵ کەسێك یا چەند کەسێکی تردا). (ب) گەڕانەوەی شتی دزراو بۆ خاوەنەکەی.
**kid** (kid), *n.* (١) (ا) کار؛ کارژۆلە. (ب) بەچکە ئاسك یا بزنە کێوی.
(٢) گۆشتی کار یا گیسك. (٣) پێستی کارو گیسك.
(٤) [Colloq.]، (ا) منداڵ. (ب) لاو؛ هەرزە. (٥) [Slang]، گاڵتە؛ گەمە.
*adj.* (١) لە پێستی کار یا گیسك درووستکراو.
(٢) [Colloq.]، بچووك (برا، خوشك)؛ بچکۆلە:
*( his ~ sister; his ~ brother)*
*v.t. & v.i.* (١) زاین (بزن).
(٢) [Slang]، (ا) خەڵەتاندن؛ بە هەڵە بردن؛ فێڵ لێکردن:
*( Don't ~ yourself.)*
(ب) گاڵتەکردن؛ گاڵتە لەگەڵ کردن؛ کلك پێوەکردن؛ گەمە کردن.
**no kidding,** (١) بێ گاڵتە (٢) بێ گاڵتە!؛ ئاشێ!
**kid gloves,** دەستکێشێکی نەرمە لە چەرمی کار یا گیسك درووست دەکرێ
**handle with kid gloves, [Colloq.],** بە ناسکی و لەسەرخۆو وورپایی لەگەڵدا جوولانەوە.
**kidnap** (kid′nap), *v.t.* فڕاندن (گەورە یا منداڵ بەتایبەتی بۆ پارە سەندن بۆ بەردانی).
-kidnaper; **kidnapper** *(n.)*.
**kidney** (kid′ni), *n.* (١) گورچیلە؛ گورچك.
(٢) (ا) سروشتی کەسی. (ب) توخم؛ جۆر.
**kidney bean,** جۆرە فاسۆلیایەکی قاوەیییە لە شێوەی گورچیلەدا.
**kidney stone,** بەردی گورچیلە.
**kidskin** (kid′skin′), *n.* چەرمی کارو گیسك (دەستکێش و پێڵاوی لێ درووست دەکرێ).
**kike** (kīk), *n.* [Slang], جوولەکە (لە ڕووی سووکییەوە).
**kill** (kil), *v.t.* (١) کوشتن؛ سەربڕین؛ مردارکردنەوە؛ خپ کردن.
(٢) فەوتاندن؛ وێران کردن؛ نەهێشتن؛ تێکدان؛ لە کەڵك خستن.
(٣) بەزاندن (گەڵاڵەی یاسا لە پەرلەماندا)؛ ژێر خستن:
*( The bill was ~ed in the committee.)*
(٤) کات کوشتن.
(٥) کوژاندنەوە (مەکینە): *( It ~ed the motor.)*.
(٦) ڕێ لە بڵاوکردنەوە گرتن: *( The editor ~ed the story.)*
(٧) نەهێشتن (ئازار)؛ کوشتن (ئێش و ئازار): *( to ~ the pain)*
(٨) [Colloq.]، بە سەردا زاڵبوون. (٩) لابردن (چاپەمەنی)؛ کوژاندنەوە
(١٠) لێدانی تۆپ ئەوەندە بە قایم کە نەتوانرێ بگەڕێنرێتەوە (یاری تەنس).
*v.i.* (١) کوشتن؛ سەربڕین؛ مردارکردنەوە.
(٢) مردن؛ فەوتان: *( These plants ~ easily.)*.
*n.* (١) کوشتار؛ کوشتن؛ کوژران؛ سەربڕین.
(٢) گیاندارێکی سەربڕاو، کوژراو، یا ڕاوکراو.
**in at the kill,** (١) ئامادەبوون لە کاتی کوشتنی گیاندارێکی ڕاوکراودا.
(٢) ئامادەبوون لە کۆتایی کارێکدا یا لەکاتی سەرکەوتنێکدا.
**kill off,** قەلاچۆکردن؛ هیچ نەهێشتن؛ بەرپاکردن.
**kill two birds with one stone,** بە بەردێك دوو نیشان شکاندن.
**kill** (kil), *n.* جۆگە؛ ڕووبار؛ چەم.
**killer** (kil′ēr), *n.* (١) کوشتیار؛ پیاوکوژ؛ خوێنڕێژ؛ بکوژ.
(٢) نەهەنگێکی دڕندەی بکوژە.
**killer whale,** جۆرە نەهەنگێکی دڕندەی بکوژە.
**killing** (kil′iŋ), *adj.* (١) کوشندە؛ بکوژ. (٢) ماندووکەر؛ هێز لێ بڕ.
(٣) [Colloq.]، زۆر جوان و دڵگیر؛ دڵفڕێن.
(٤) [Colloq.]، قۆشمە؛ زۆر سەیر؛ سەیرخۆش.
*n.* (١) کوشتار. (٢) [Colloq.]، دەسکەوتێك، قازانجێك، یا سەرکەوتنێکی گەورەو لەپڕ: *( He made his ~ in real estate.)*.
**kill-joy** (kil′joi′), *n.* کەسێك کە خۆشی لە خەڵك تێك دەدات.
**kiln** (kil, kiln), *n.* کڵ؛ کوورەی گۆزەو دیزە سوورکردنەوە.
*v.t.* کڵ دان؛ گۆزەو دیزە سوورکردنەوە لە کوورە یا کڵ دا.
**kilo** (kē′lō, kil′ō), *n.* (١) کیلۆ؛ کیلۆگرام. (٢) کیلۆمەتر.
**kilo-** (kil′ō, kil′ə), پێشگرێکە بەمانای: هەزار:
*( kilogram, kilowatt)*
**kilogram, kilogramme** (kil′ə-gram′), *n.* کیلۆگرام؛ هەزار گرام.
**kilometer, kilometre** (kil′ə-mē′tēr), *n.* کیلۆمەتر؛ هەزار مەتر.
**kilowatt** (kil′ə-wot′, kil′ɔ-wôt′), *n.* کیلۆوات؛ هەزار " وات "
**kilt** (kilt), *v.t.* (١) توێ یا چرچ خستنە جل و بەرگەوە.
(٢) [Scot.]، تەنوورە یا جل هەڵکردن؛ توندکردنەوە.
*n.* تەنوورەیەکی تا ئەژنۆی توێ توێ یا چرچدارە پیاوانی ئوسکوتلەندە لەبەری دەکەن.
**kilter** (kil′tēr), *n.* [Colloq.], *Also* **kelter,** بە ڕێك و پێکی کارکردن؛

به باشی گەڕان (مەکینە): ( *in ~ ; out of ~* ) .

**kimono** (kə-mō′nə, ki-mō′nō), *n.* (١) کراسێکی دەڵبی درێژی قۆڵ کورت و زل یابانی‌یە بۆ ژن و پیاو. (٢) کراسێکی دەڵبی درێژی ژنانەیە.

**kin** (kin), *n.* (١) خزم؛ خزم و کەس‌وکار. (٢) خزمایەتی؛ کەس‌وکارێتی.

*adj.* خزمن؛ خزم؛ نزیك (پەیوەندی).

**near of kin,** خزمی زۆر نزیك؛ زۆر نزیك.

**next of kin,** خزمی هەرە نزیك؛ نزیکترین خزم.

**of kin,** نزیك (پەیوەندی)؛ خزم.

**kind** (kīnd), *n.* (١) [Rare or Archaic] ، (ا) سەرچاوە؛ بنەچە.

(ب) سروشت. (ج) شێوە.

(٢) توخم؛ ڕەگەز: ( *What ~ of dog is that?* ) .

(٣) جۆر؛ چەشن.

( *the ~ of people who are cheerful in the morning* )

**after one's ( or its ) kind,** [Archaic], وەك توخمی خۆ؛ بەگوێرەی سرووشتی توخمی خۆ.

**in kind,** (١) شت گۆڕینەوە؛ شت کڕین بە شت نەك بە پارە.

(٢) بە هەمان شێوە لەگەڵ جووڵانەوە: ( *to repay insolence in kind* ) .

**kind of,** [Colloq.], نەختێ؛ تۆزێ: ( *She is kind of pretty.* ) .

**of a kind,** (١) هاو؛ هەمان؛ هەمان چەشن؛ هاوتوخم.

(٢) قەڵب؛ ناپەسەند؛ بازاڕی؛ خراپ: ( *entertainment of a kind* ) .

**kind** (kīnd), *adj.* (١) دڵنەرم؛ بەبەزەیی؛ بەڕەحم (٢) ڕووخۆش.

(٣) گەرم (هەست)؛ لە دڵەوە: ( *~ regards* )

**kindergarten** (kin′dẽr-gär′t'n), *n.* باخچەی منداڵان.

**kindergartner, kindergartener** (kin′dẽr-gärt′nẽr), *n.* (١) منداڵی باخچەی منداڵان (٢) مامۆستای باخچەی منداڵان.

**kindhearted** (kīnd′här′tid), *adj.* دڵنەرم؛ بەڕەحم؛ بەبەزەیی.

**kindle** (kin′d'l), *v.t.* (١) سووتاندن؛ ئاگر تێبەردان.

(٢) داگیرساندن؛ ئاگرکردنەوە. (٣) هێنانە جۆش؛ خستنە جۆش.

(٤) ڕووناك کردنەوە؛ بووژاندنەوە.

*v.i.* (١) ئاگرگرتن؛ سووتان (٢) هاتنە جۆش

(٣) بووژانەوە (٤) ڕووناکبوونەوە؛ داگیرسان؛ گەشبوونەوە.

**kindle** (kin′d'l), *v.t. & v.i.* [Dial.], زاین (گیاندار)

**kindliness** (kīnd′li-nis), *n.* (١) دڵنەرمی؛ بەڕەحمی؛ بەزەیی.

(٢) کارێکی بەڕەحمانە

**kindling** (kin′dliŋ), *n.* چڵ‌وچێو؛ چاوگە؛ چیلکەی ئاگر.

**kindly** (kīnd′li), *adj.* (١) دڵنەرم؛ بەبەزەیی؛ بەڕەحم.

(٢) خۆش؛ باش ( *a ~ climate* ) .

(٣) [Archaic]، زگماکی؛ سرووشتی.

*adv.* (١) بە دڵنەرمانە؛ بەڕەحمەوە. (٢) بە باشی؛ بە چاکی.

(٣) تکایە: ( *~ shut the door.* ) .

(٤) [Obs.]، لەخۆوە؛ بە زگماکی: ( *take ~ to* ) .

**take kindly to,** بەدڵ بوون؛ پەسەندکردن؛ حەزلێکردن.

**kindness** (kīnd′nis), *n.* (١) دڵنەرمی؛ ڕەحم؛ بەڕەحمی؛ بەزەیی.

(٢) کارێکی دڵنەرمانە یا بە ڕەحم

**kindred** (kin′drid), *n.* (١) خزمایەتی (٢) خزم؛ خزم و کەس‌وکار

(٣) لەیەکچوون (سرووشت و دەروون)؛ وەك یەکی؛ هاو.

*adj.* (١) خزم؛ نزیك (پەیوەندی خزمایەتی)

(٢) لەیەك دەچن لە سرووشت و دەروونەوە؛ نزیك (پەیوەندی گیانی، بیروباوەڕ)؛ وەك یەکن: ( *We are ~ spirits.* ) .

**kinematics** (kin′ə-mat′iks), *n.pl.* زانستی بزووتن (زانستی میکانیکی)

**kinetic** (ki-net′ik, kī-net′ik), *adj.* تایبەتی بە بزووتن.

**kinetics** (ki-net′iks, kī-net′iks), *n.pl.* زانستی بزووتنی شت لە ڕووی ئەو هێزانەوە کە دەبێتە هۆی ئەم بزووتنە.

**kinfolk** (kin′fōk′), *n.pl.* [Dial.], = kinsfolk.

**king** (kiŋ), *n.* (١) پاشا؛ شا.

(٢) کەسێکی زۆر سەرکەوتوو و بەرز لە کارەکەیدا: ( *an oil ~* ) .

(٣) شتێکی هەرە بەرز و نایاب لە توخمەکەیدا.

(٤) شا (شەترەنج و دامە و یاری و قوماری کاغەز).

**king crab,** قرژاڵی گەورە.

**kingdom** (kiŋ′dəm), *n.* (١) شانشین.

(٢) جیهان؛ مەودا: ( *the ~ of poetry* ) .

(٣) یەکێك لە سێ بەشەکەی سرووشت کە جیهانی گیاندار و سەوزە و کانزان

(٤) [Archaic]، پاشایەتی؛ دەسەڵاتی پاشا

(٥) جیهانی خودایی.

**kingfish** (kiŋ′fish′), *n.* (١) شاماسی: چەند جۆرە ماسی‌یەکی گەورەن.

(٢) [Colloq.]، سەردار؛ سەردەستە؛ سەرۆك.

**kinglet** (kiŋ′lit), *n.* (١) پاشایەکی بێ بایەخ؛ پاشای وڵاتێکی بچووك و بێ بایەخ. (٢) کڵاوکوڕە

**kingly** (kiŋ′li), *adj.* پاشایانە؛ بۆ پاشا دەشێت ئەوەندە نایابە؛ نایاب.

*adv.* [Archaic], پاشایانە.

**-kingliness** *(n.).*

**king post,** شا کۆڵەکە؛ شا دیرەك.

**king's ( or queen's ) English, the,** زمانی ئینگلیزی ڕەسەن؛ ئینگلیزی پەتی کە پەسەندە بۆ نووسین و ئاخاوتن و وشەی بازاڕی تێدا نی‌یە

**king's evil,** دەردەباریکە؛ سیلی لووی لەمفاوی بەتایبەتی هی مل.

**kingship** (kiŋ′ship), *n.* (١) پاشایەتی؛ دەسەڵاتی پاشا.

(٢) فەرمانڕەوایی؛ پاشایەتی. (٣) خاوەن شکۆ: ( *His ~* ) .

**king-size** (kiŋ′sīz′), *adj.* [Colloq.], گەورە؛ زل؛ زۆر گەورە: ( *a ~ cigarette* )

**king-sized** (kiŋ′sīzd′), *adj.* = king-size.

**kink** (kiŋk), *n.* (١) لوول (قژ، پەت، تەل، دەزوو). (٢) گرێ؛ کۆسپ.

(٣) کۆڵنج؛ کرژی بە ئازاری ماسولکە.

(٤) (ا) هەوەس؛ بیر یا ئارەزوویەکی سەیر و لەپڕ.

(ب) خوویەکی سەیر و نائاسا

*v.i. & v.t.* لوول بوون؛ لوول کردن؛ کرژبوون.

**kinky** (kiŋ′ki), *adj.* (١) لوول (قژ)؛ کرژ: ( *~ hair* ) .

(٢) [Slang]، سەیر و نائاسا (خوو).

**-kinkiness** *(n.).*

**kinsfolk** (kinz′fōk′), *n.pl.* خزم؛ خزمان؛ خزم و کەس‌وکار.

**kinship** (kin′ship), *n.* (١) خزمایەتی. (٢) پەیوەندی نزیك.

**kinsman** (kinz′mən), *n.* خزمی نێرینە؛ خزمی پیاو.

**kinswoman** (kinz′woom′ən), *n.* خزمی مێینە؛ ژنە خزم.

**kiosk** (ki-osk′), *n.* (١) سابات؛ کەپر. (٢) قەفەز (بۆ شت تێدا فرۆشتن وەك کانتین یا بۆ تێدا دانیشتن و چاودێری کردنی شتێك).

**kip** (kip), *n.* (١) پێستەی خۆش نەکراوی گوێرەکە و کاوڕ و گیانداری بچووکی تر. (٢) کۆمەڵێك پێستەی وەها.

**kip** (kip), *n.* (١) [Slang] ، (ا) خانوویەك کە هەر ژوورەی بە کرێ درابێ بە کەسێك. (ب) ژوورێکی وەها. (ج) جێی نووستن. (٢) [Obs.]، قەحبەخانە

**kipper** (kip′ẽr), *v.t.* پاك کردن و کردن بە قاورمەی ماسی " سەلمۆن ".

*n.* (١) ماسی " سەلمۆن " یا " تراوت " لە سەردەمی هێلکە کردندا.

(٢) ئەم جۆرە ماسی‌یە بە قاورمەکراوی.

**kirk** (kũrk), *n.* [Scot. & North England], کلێسە.

**the Kirk,** کلێسەی ئوسکوتلەندە.

**kismat, kismet** (kiz′mət, kis′mət), *n.* چارەنووس.

**kiss** (kis), *v.t. & v.i.* (١) ماچ کردن.

(٢) بە ئاستەم یا بە هێواشی دەست تێوەدان یا بەرکەوتن.

*n.* (١) ماچ. (٢) بە ئاستەم بەرکەوتن. (٣) جۆرە نوقوڵێکە.

**kisser** (kis′ẽr), *n.* (١) ماچکەر. (٢) [Slang] ، (ا) لێو. (ب) دەم‌وچاو.

**kit** (kit), *n.* (١) سەتڵێك یا دەفرێکی دارین.

(٢) (ا) كۆڵی ئازووقەی سەرباز (جگە لە چەك)

(ب) كەرەسەو ئازووقەی گەشت: *( a travel ~ )*

(ج) كەرەسەی كار (بەتایبەتی وورده كەرەسە): *( a mechanic's ~ )*.

(٣) قوتو یا سنووقی كەرەسەو ئازووقە تیا هەڵگرتن.

(٤) [Colloq.]، دەستە؛ تاقم؛ كۆمەڵ.

**the whole kit and caboodle,** [Colloq.]. سەرپاك؛ هەموو؛ گشتی؛ هەموویان (مرۆڤ، شت)؛ بە گەورەو بچووكەوە

**kit** (kit), *n.* = kitten.

**kit** (kit), *n.* [Rare]. كەمانچەیەكی بچووك

**kitchen** (kich′ən), *n.* (١) چێشتخانە؛ مووبەق.

(٢) كەرەسەی چێشت لێنان

**kitchenette** (kich′ən-et′), *n.* چێشتخانەی بچووك؛ مووبەقی بچووك

**kitchen garden,** باخچەی سەوزەو میوەهات بۆ بەكارهێنانی خۆ.

**kitchenware** (kich′ən-wâr′), *n.* قاپو قاچاغی چێشتخانە وەك مەنجەڵو تاوەو شتی وەها

**kite** (kīt), *n.* (١) كۆلارە؛ داڵ (٢) كەسێكی چاوبرسیو بە هەڵپە؛ كەسێكی زۆڵو قومارباز (٣) كۆلارەی منداڵان.

(٤) بایەوانی سووكو بەرز (٥) كومپیالەیەكی بێ نرخ یا ساختە.

*v.i.* [Colloq.], (١) فرین وەك كۆلارە؛ فرین بە بێ خشپەو خێرا.

(٢) پارە دەستكەوتن بە كومپیالەو چەكی بێ نرخ یا ساختە

*v.t.* نووسین یا دانی كومپیالەی بێ نرخ یا ساختە

**kith** (kith), *n.* [Archaic]. برادەران؛ خزمان؛ دەرودراوسێ.

**kith and kin,** برادەرو دەرودراوسێو خزمو كەسوكار.

**kitten** (kit′'n), *n.* بەچكە پشیلە؛ بێچووە پشیلە یا هی هەندێ گیانداری تر

*v.i. & v.t.* تۆرەكین (پشیلە)؛ بەچكەبوون

**kitty** (kit′i), *n.* (١) بەچكە پشیلە؛ بێچووە پشیلە. (٢) پشیلە

**kitty** (kit′i), *n.* ئەو پارەیەی قومارچی كۆی دەكەنەوە بۆ كڕینی شتێك بە كۆمەڵ وەك خواردنەوە یا خواردن... هتد)

**kitty-cornered** (kit′i-kôr′nērd), *adj. & adv.* *Also* kitty-corner, لابەلا؛ چەپو ڕاست

**Klan** (klan), *n.* = Ku Klux & Klan.

**kleptomania** (klep′tə-mā′ni-ə), *n.* *Also* cleptomania, حەز لە دزی كردن (بەتایبەتی وورده شتی فرۆشگا یا ئاومان)

**-kleptomaniac** *(adj.).*

**knack** (nak), *n.* (١) (ا) فێڵ. (ب) ڕێگەیەكی ئاسانو زیرەكانە بۆ كردنی شتێك (٢) شارەزایی (كردنی كارێك)؛ كارامەیی؛ توانا؛ بەهرە؛ سەر لێ دەرچوون؛ سەلیقە (بۆ كردنی شتێك بە باشی).

*( to have a ~ for doing something)*

(٣) [Rare]، زیرەنگیانە؛ شتی ڕازانەوەی هەرزانبەها یا بازاڕی.

**get the knack for,** فێربوونی كردنی شتێك بە ئاسانیو بە خێرا؛ پێ ڕاهاتن بە كردنی كارێكو ئاسان بوونی

**knap** (nap), *v.t. & v.i.* [Dial.]. (١) پیاكێشان؛ پیادان

(٢) شكاندن؛ تەقەزم لێكردنەوە. (٣) گازلێگرتن؛ پەلاماردان.

**knap** (nap), *n.* [Dial.]. تەوقەسەری گرد؛ یۆپ

**knapsack** (nap′sak′), *n.* كۆڵ؛ توورەكەیەكە كەرەسە، ئازووقە، پەڕتووك یا وورده شتی تێ دەكرێو دەدرێ بە شاندا؛ توورەكەی شان

**knave** (nāv), *n.* (١) [Archaic]، (ا) بەردەستی نێرینە

(ب) پیاوێكی بێ پلەوپایە یا بنەچە نزم.

(٢) كەسێكی زۆڵو قوماربازو ناپاك؛ كەسێكی ناكەس بەچەو ناپیاو.

**knavery** (nāv′ēr-i), *n.* ناكەس بەچەیی؛ ناپاكی و زۆڵی؛ كردەوەی ناپاكو پیسو زۆڵانە

**knavish** (nāv′ish), *adj.* ناپاك؛ ناكەس بەچە؛ ناكەس بەچەیی؛ زۆڵو نامەرد

**knead** (nēd), *v.t.* (١) شێلان (هەویر، قوڕ). (٢) شێلان (پشت، لەش).

**knee** (nē), *n.* (١) ئەژنۆ؛ چۆك؛ كەشكەژنۆ. (٢) ئەژنۆی پانتۆڵ.

(٣) گۆشە (دارتاشی).

*v.t.* (١) ئەژنۆ پیادان؛ بە ئەژنۆ لێدان؛ ئەژنۆ بەركەوتن.

(٢) بە گۆشە قایم كردن (دارتاشی).

**bring to one's knees,** سەر پێ دانەواندن؛ سەر پێ شۆڕكردن؛ بەزاندن.

**knee breeches,** پانتۆڵی كورت (هەتا ئەژنۆ)

**knee-cap** (nē′kap′), *n.* (١) كەشكەژنۆ؛ كڵاوەی ئەژنۆ؛ كاسەی ئەژنۆ.

(٢) پەڕۆ یا شتێكی وەها كە دەكرێتە سەر كڵاوەی ئەژنۆ بۆ پاراستنی.

**knee-deep** (nē′dēp′), *adj.* (١) دەگاتە ئەژنۆ؛ هەتا ئەژنۆ دێت.

(٢) هەتا ئەژنۆ داپۆشراوە؛ نوقوم بووە هەتا ئەژنۆ:

*( They stood ~ in water.)*

(٣) سەرقاڵ.

**knee-high** (nē′hī′), *adj.* دەگاتە ئەژنۆ؛ ئەوەندەی ئەژنۆ بەرزە:

*( ~ grass)*

**knee jerk,** فرتەفرتی ئەژنۆو لاق؛ فرتەی ئەژنۆ.

**kneel** (nēl), *v.i.* (١) چۆك دادان

(٢) كڕنووش بۆ بردن؛ سەر بۆ دانەواندن.

**knee-pad** (nē′pad′), *n.* پەڕۆیەكە وەرزشكار ئەژنۆی پێ دەپارێزێت.

**knell** (nel), *v.i.* (١) لێدانی زەنگی كڵێسە بە بۆنەی مردنی كەسێكەوە.

(٢) دەنگی شیوەن یا بەدوومی لێوە هاتن.

*v.t.* (١) بانگ كردن یا بڵاوكردنەوەی دەنگوباس بە زەنگ لێدان.

(٢) [Obs.]، زەنگ لێدان.

*n.* (١) دەنگی زەنگی كڵێسە لەكاتی پرسەی مردوویەكدا.

(٢) نیشانەی مردن یا بەدوومی. (٣) دەنگێكی غەمگین.

**knelt** (nelt), *alternative past tense and past participle of* kneel.

**knew** (nōō, nū), *past tense of* **know.**

**knicker-bocker** (nik′ēr-bok′ēr), *n.* (١) كەسێكی نیویۆركی كە لە بنەچەی هۆڵەندی بێت. (٢) كەسێكی نیویۆركی.

(٣) [k-]، شەرواڵێكی هەڵكراو تا ئەژنۆ.

**knickers** (nik′ērz), *n.pl.* (١) شەرواڵێكی هەڵكراو تا ئەژنۆ.

(٢) بەرگێكی ژێرەوەی ژنانە كە لەم پانتۆڵە دەچێ.

**knick-knack** (nik′nak′), *n.* زیرەنگیانە؛ خشڵی هەرزانبەها یا بازاڕی.

**knife** (nīf), *n.* (١) چەقۆ. (٢) دەمی تیغ یا مەكینەی بڕین.

*v.t.* (١) چەقۆ لێدان؛ بەر چەقۆ دان؛ بریندارکردن بە چەقۆ.

(٢) [Colloq.]، لە ژێرەوە ناپاكی لەگەڵ كردن؛ بە دزییەوە ئازاردان

**under the knife,** [Colloq.], لە ژێر نەشتەركاریدایە.

**knife-edge** (nīf′ej′), *n.* (١) دەمە چەقۆ. (٢) دەمە تیغ

(٣) ڕاگرەی تەرازوو.

**knight** (nīt), *n.* (١) شاسوار؛ كەڵەسوار؛ پلەیەكی شاسوارییە كە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا پاشا دەیدا بە سوارچاكی بەگزادە.

(٢) ئەسپ (شەترەنج).

*v.t.* پلەی كەڵەسواری پێدان: *( He was ~ed for his war services.)*.

**knight-errant** (nīt′er′ənt), *n.* كەڵەسواری گەڕۆك: كەڵەسوارێكە كە دەگەڕێ بە شوێن شەڕوشۆڕو ئەمێنتنی ئاهەقیدا بۆ ئازایەتی نواندن

**-knight-errantry** *(n.).*

**knighthood** (nīt′hood), *n.* (١) پلەوپایەی كەڵەسوار.

(٢) كەڵەسواری؛ شاسواری. (٣) كەڵەسواران؛ شۆڕەسواران.

**knightliness** (nīt′li-nis), *n.* كەڵەسوارێتی؛ شاسوارێتی.

**knightly** (nīt′li), *adj.* (١) تایبەتی بە كەڵەسوار؛ كەڵەسواری؛ شاسواری. (٢) لە كەڵەسواران پێكهاتوو.

*adv.* [Archaic], كەڵەسوارانە؛ شاسوارانە

**knit** (nit), *v.t.* (١) چنین. (٢) پێكەوەبەستن؛ كردن بەیەك.

(٣) ناوچەوان گرژکردن؛ برۆ هێنانەوەیەك.
(٤) [Archaic & Dial.]، گرێدان؛ پێکەوە گرێدان.
*v.i.* (١) چنین
(٢) سارێژبوونەوە (ئێسقانی شکاو، برین)؛ بوونەوە بەیەك (ئێسقان).
(٣) هاتنەوەیەك (برۆ)؛ گرژبوون: ***( His brows ~ in thought.)*** .

**knitting** (nit′iŋ), ***n.*** (١) چنین. (٢) چنراو؛ شتێکی چنراو.

**knives** (nīvz), ***n.*** *plural of* knife.

**knob** (nob), ***n.*** (١) گرێ، دوگمە؛ چوکلەیەکی خڕ؛ گۆزیکە.
(٢) دەسکی دەرگا؛ دەسکی خڕ. (٣) گردێکی خڕ؛ شاخێکی خڕ.

**knobbed** (nobd), ***adj.*** گرێدار، گرێ گرێ؛ دەسکدار

**knobby** (nob′i), ***adj.*** (١) گرێ گرێ؛ گرێدار؛ گرێ یاوی.
(٢) وەك گرێ، دوگمە، یا گۆزیکە.

**knobkerrie** (nob′ker′i), ***n.*** کوتەك

**knock** (nok), ***v.i.*** (١) لە دەرگادان. (٢) پیادان؛ لێدان؛ بەیەکدادان؛ بەرکەوتن. (٣) تەقەتەق یا تەپەتەپ کردن (مەکینە).
(٤) [Colloq.]. رەخنەگرتن.
***v.t.*** (١) پیادان، پیاکێشان؛ لێدان.
(٢) ( **~ down; ~ off** ) بە زەویدادان؛ خستن.
(٣) کون تێکردن بە پیاکێشان یا پیادان: ***( He ~ed a hole in the wall)*** .
(٤) [Colloq.]. رەخنەگرتن.
***n.*** (١) پیادان؛ لێدان؛ پیاکێشان. (٢) لە دەرگادان؛ تەقەی دەرگا.
(٣) تەقەتەق یا تەپەتەپی مەکینە. (٤) [Colloq.]، رەخنە.

**knock about ( or around ), [Colloq.],** (١) گەڕان
(٢) بێزارکردن؛ شەق و زللەو مستەکۆلە لێدان پەیتا پەیتا.

**knock down,** (١) بە زەویدادان؛ پخ دان؛ خستن.
(٢) هەڵوەشاندنەوەی شتێك بۆ گواستنەوەی بە ئاسانی.
(٣) نرخ کەمکردنەوە؛ نرخ هێنانەخوارەوە.

**knock off,** (١) (ا) [Colloq.]. پایدوس لێکردن؛ دەست لە کار هەڵگرتن.
(ب) کار بەجێهێشتن. (٢) [Colloq.]، لێ داشکان؛ لێ دەرکردن:
***( He knocked off five dollars from the price.)***
(٣) [Colloq.]. کردن؛ بەجێهێنان؛ تەواوکردن (نووسین، کار).
(٤) [Slang]، کوشتن. (٥) [Slang]، دزین.
(٦) [Slang]. گاین؛ چوونە جێ لەگەڵ.

**knock out,** (١) بە زەویدادان (بۆکسبازی).
(٢) بێ هۆش کردن؛ هێز لێ برین؛ هۆش لێ برین.
(٣) بەزاندن: ***( to knock out a competitor)*** .
(٤) پەکخستن؛ لەکارخستن. (٥) [Colloq.]، کردنی شتێك بە پەلە.
(٦) [Slang]. سەرسام کردن؛ واق وڕماندن.

**knock up,** (١) [British Slang] ، ماندووکردن؛ هێز لێ برین.
(٢) [Slang]. سکپڕکردن.

**knockdown** (nok′doun′), ***adj.*** (١) قایم (لێدان، پیاکێشان)؛ توند.
(٢) بە ئاسانی هەڵدەوەشێنرێ: ***( a ~ table)*** .
***n.*** (١) بۆکسێك یا زللەیەك کە پیاو دەدات بە زەویدا.
(٢) خستن، کوتن؛ بە زەویدادان. (٣) [Slang]، پێ ناسین بە کەسێك.

**knocker** (nok′ēr), ***n.*** دەرگا پێ لێدەر ئەڵقەیەکی ئاسنە بە دەرگاوە چەسپێنراوە لە دەرگای پێ دەدرێت

**knock-out** (nok′out′), ***adj.*** بە زەویدادەر (بۆکس، زللە).
***n.*** (١) بۆکسێکی بێهۆشکەر. (٢) بە زەویدادان (بۆکسبازی)؛ خستن.
(٣) دلڕفێن؛ جوان؛ نایاب؛ زۆر چاك: ***( She is a ~.; The film is a ~.)***

**knoll** (nōl), ***n.*** تەپۆلکە؛ گردۆلکە

**knot** (not), ***n.*** (١) گرێ. (٢) گرێ یا ئەڵقەیەك لە شریتێکدا بۆ جوانی.
(٣) کۆمەڵ (مرۆڤ، شت)؛ تاقم؛ دەستە؛ تۆپەڵ. (٤) پەیوەندی ژن و مێردایەتی.
(٥) گیروگرفت؛ کێشە؛ ئاڵۆسکاوی؛ ئاڵۆزی. (٦) گرێی دار.
(٧) (ا) پێوانەی خێرایی کەشتی لە سەعاتێکدا: ***( a vessel of 15 ~s)*** .
(ب) میلی دەریایی.

***v.t.*** (١) گرێدان؛ گرێ لێدان. (٢) ئاڵۆسکاندن؛ ئاڵۆزاندن.
***v.i.*** (١) گرێ خواردن. (٢) ئاڵۆسکان؛ ئاڵۆزان.

**knot** (not), ***n.*** باڵندەیەکە لە نزیك دەریاوە دەژی.

**knotted** (not′id), ***adj.*** (١) گرێدراو؛ گرێ لێدراو؛ بە گرێ قایم کراو.
(٢) گرێدار؛ گرێ یاوی؛ پڕ لە گرێ
(٣) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو. (٤) سەیر؛ سەرسوڕمێنەر.

**knotty** (not′i), ***adj.*** (١) گرێدار؛ گرێ یاوی؛ پڕ لە گرێ:
***( a ~ board)***
(٢) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو؛ چارەسەرکردنی گرانە؛ ئاڵۆزاو: ***( a ~ problem)*** .

**know** (nō), ***v.t.*** (١) زانین: ***( We ~ the facts.)*** .
(٢) ئاگا لێ بوون؛ پێ زانین. (٣) شارەزابوون.
(٤) لێ زانین: ***( She ~s music.)*** .
(٥) ناسینەوە؛ ناسین: ***( I'd ~ that face anywhere.)*** .
(٦) لەیەك جیاکردنەوە؛ جیاکردنەوە:
***( It is not always easy to ~ right from wrong.)***
(٧) چوونە جێ لەگەڵ؛ جووت بوون لەگەڵ؛ گاین:
***( Have you known her?)***
***v.i.*** (١) زانین. (٢) ئاگا لێ بوون؛ پێ زانین.

**in the know, [Colloq.],** دەنگوباسی نهێنی لایە؛ شتی نهێنی دەزانێت

**knowable** (nō′ə-b′l), ***adj.*** دەتوانرێ بزانرێ؛ دەزانرێت

**know-how** (nō′hou′), ***n.*** [Colloq.], شارەزایی؛ لێ زانین؛ کارامەیی.

**knowing** (nō′iŋ), ***adj.*** (١) بزان؛ ئاگادار.
(٢) زۆرزان؛ زرنگ؛ دانا؛ زیرەك.
(٣) ئاگاداری دەگەیێنێت؛ نیشانەی ئاگا لێ بوون یا زانینە: ***( a ~ look)*** .
(٤) دەسەنقەستی؛ دەسەنقەست.

**knowingly** (nō′iŋ-li), ***adv.*** (١) بە دەسەنقەست:
***( I would never ~ do anything to hurt you.)***
(٢) بە شێوەیەکی وەها کە نیشانەی زانین یا ئاگا لێ بوون بێ:
***( to look ~ at a person)***

**know-it-all** (nō′it-ôl′), ***adj.*** [Colloq.], بە لە هەموو شت زان یا شارەزا خۆ دەرخەر: ***( a ~ attitude)*** .
***n.*** کەسێك کە وا خۆی دەردەخات لە هەموو شت دەزانێ و شارەزایە.

**knowledge** (nol′ij), ***n.*** (١) (ا) زانین. (ب) لێ زانین؛ شارەزایی.
(ج) ئاگاداری. (د) تێگەیشتن. (٢) زانست؛ زانیاری؛ زانستی.
(٣) شتی زانراو.
(٤) [Archaic]، جووت بوون؛ چوونە جێ لەگەڵ؛ گاین: ***( carnal ~)*** .

**to ( the best of ) one's knowledge,** بەپێی زانینی خۆ؛ ئەوەندەی کە یەکێك یا کەسێك بیزانێ:
***( to the best of my knowledge he is an honest man.)***

**knowledgeable** (nol′ij-ə-b′l), ***adj.*** شارەزا؛ تێگەیشتوو؛ زانا؛ بزان.

**known** (nōn), *past participle of* **know.**

**know-nothing** (nō′nuth′iŋ), ***n.*** (١) هیچ نەزان؛ کەسێکی هیچ نەزان. (٢) کەسێکی بێ ئاین.

**knuckle** (nuk′′l), ***n.*** (١) جومگە؛ کەشك؛ گرێی پەنجە.
(٢) خرتکەی گیاندار بە گۆشتی دەورووپشتییەوە کە شلەو شۆربای پێ لێ دەنرێت. (٣) جومگەی ئەنجامە. (٤) (*pl.*) بۆکسی ئاسن.
***v.t.*** کەشك لێدان؛ لێدان بە جومگەی پەنجە.

**knuckle down,** (١) بە دڵ هەوڵدان؛ بە چالاکی کۆشش کردن.
(٢) مل دان؛ مل شۆڕکردن؛ دەست هەڵگرتن؛ ڕووخان (مرۆڤ).

**knuckle under,** مل دان؛ مل شۆڕکردن؛ دەست هەڵگرتن؛ ڕووخان (مرۆڤ).

**knucklebone** (nuk′′l-bōn′), ***n.*** (١) جومگە؛ ئێسقانی جومگە

(٢) ئیسقانێک و جومگەی گیاندار.

**knuckleduster** (nuk′'l-dus′tẽr), *n.* بۆکسی ئاسن

**kohl** (kōl), *n.* کل

**kook** (kōōk), *n.* [Slang], کەسێکی شێتۆکە و سەیر.

**kopeck, kopek** (kō′pek), *n.* کۆپێک پارەیەکی یەکێتی سۆڤیەتی جارانە سەدیەکی " ڕۆبڵ " ێکە

**Koran** (kō-rän′, kō′ran), *n.* قورئان

**Korean** (kō-rē′ən, kô-rē′ən), *adj.* تایبەتی بە کۆریا و گەلەکەی و زمانەکەی و کلتوورەکەی.

*n.* (١) کەسێکی کۆری. (٢) زمانی کۆری

**kosher** (kō′shẽr), *adj.* (١) (ا) پاک و خاوێن بەپێی دەستووری ئاینی جوولەکە (خواردەمەنی): ***( ~ food)*** .

(ب) خواردنی پاک و خاوێنی تێدا دەفرۆشرێ یا لێ دەنرێ بەگوێرەی ئاینی جوولەکە ***( a ~ kitchen)*** .

(٢) [Slang]، پەسەند؛ درووست؛ چاک؛ باش؛ ڕەوا؛ ڕاست؛ بەجێ.

*n.* خواردەمەنی پاک و خاوێن بەپێی دەستووری ئاینی جوولەکە.

*v.t.* پاک و خاوێن کردن (خواردەمەنی).

**koto** (kō′tō), *n.* ئامێرێکی مۆسیقای ژێداری یاپانیە.

**kremlin** (krem′lin), *n.* قەڵای شارێک لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران

**the Kremlin,** (١) قەڵای مۆسکۆ کە بارەگای فەرمانڕەوای یەکێتی سۆڤیەتە (٢) فەرمانڕەوای یەکێتی سۆڤیەت.

**Ku Klux Klan** (kū′kluks′klan′), کۆمەڵەی کو کلەکس کلان: کۆمەڵەیەکی ڕەگەزپەرستە سپیەکانە لە بەشی خوارووی ئەمەریکادا دامەزرێنرا لە دوای شەڕی ناوخۆی ئەمەریکاوە بۆ درێژەپێدانی پێشێل کردنی مافی قولەڕەشەکان و زاڵی ڕەگەزی سپی.

**Ku Klux Klanner,** ئەندامێکی کۆمەڵەی " کو کلەکس کلان " ی ڕەگەزپەرست (ووشەی پێشوو ببینە)

**kumquat** (kum′kwôt), *n.* (١) یەنگی دنیا (٢) درەختی ئەم میوەیە.

**Kurd** (kũrd, koord), *n.* کورد.

**Kurdish** (kũr′dish, koor′dish), *adj.* کوردی؛ تایبەتی بە گەلی کورد و زمانەکەی و کلتوورەکەی؛ شتی کوردی.

*n.* زمانی کوردی؛ کوردی (زمان).

**Kurdistan** (kũr′di-stan′, koor′di-stän′), *n.* کوردستان

**kyack** (kī′ak), *n.* (باری وولاخ)؛ شەلتە.

# L l

**L, l** (el), ***n.*** (١) تیپی دوانزەهەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزی‌یە
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " ئێل ". (٣) قاڵبی ئەم تیپە.
(٤) نیشانەی دوانزەهەم لە لیستەیەکدا.
***adj.*** (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) دوانزەهەم.

**L** (el), ***n.*** (١) شتێك لە شێوەی ئەم تیپەدا (بەتایبەتی نەخشەی خانوو).
(٢) نیشانەی ژمارە (٥٠) لە لاتینیدا.

**lab** (lab), ***n.*** [Colloq.], = **laboratory.**

**label** (lā'b'l), ***n.*** (١) نیشان؛ شەقڵ؛ نیشانە؛ کارتی ناو و ناونیشان و
ناوەڕۆك (کە دەنووسێنرێ بە فرۆتەنێیەك، نامەیەك، یا شتی ترەوە).
(٢) ناونیشان: ناوی نراو لە کەسێك، کۆمەڵێك، یا شتێك؛ نیشانە.
(٣) بەرزەکێکی جوانە لەسەر دەرگا و پەنجەرەوە (خانووسازی).
***v.t.*** (١) نیشانەکردن: شەقڵ کردن؛ مۆرکردن؛ ناو و ناونیشان لێدان یا
لەسەر نووسین: ***( They ~led the boxes.)***.
(٢) ناولێنان؛ ناو خستنەدوا:
***( to ~ a person a "liberal" or "conservative")***

**labial** (lā'bi-əl), ***adj.*** (١) لێوی: لێوەکی؛ دوو لێوی.
(٢) بە لچ و لێو بێژراو (دەنگناسی): وەك تیپی: ( **b, p, m** ).
***n.*** دەنگێکی لێوی.

**labialize** (lā'bi-əl-īz'), ***v.t.*** بە لێو بێژرانی دەنگ، هەندێ جار
لە ڕادە بەدەرانە

**-labialization** ***(n.).***

**labiodental** (lā'bi-ō-den't'l), ***adj.*** بە لێوو ددان بێژراو
(دەنگناسی): وەك تیپی: ( **f, v** ).

**labium** (lā'bi-əm), ***n.*** (١) لێو؛ لچ (٢) (کۆ) لچی زێی ئافرەت.
(٣) لێوی کۆپەرەی هەندێ گوڵ. (٤) لێوی خوارووی هەندێ جانەوەر.

**labor** (lā'bēr), ***n.*** (١) کار؛ ئیش؛ ڕەنج؛ فرمان.
(٢) ئەرك: کارێکی تایبەتی. (٣) کرێکاران؛ چینی کرێکاران:
***( the right of ~ ; skilled and unskilled ~ )***
(٤) ئیشی کرێکاران؛ ڕەنجی کرێکار.
(٥) بەرەژان؛ ژانی منداڵبوون: ***( She's in ~ )***.
***v.i.*** (١) ڕەنجدان؛ کارکردن؛ فرمان کردن؛ ئیشکردن.
(٢) هەوڵدان؛ کۆشش کردن؛ خۆ ماندووکردن؛ ئارەق ڕشتن.
(٣) (ا) بە زەحمەت و بە هێواشی ڕۆیشتن:
***( The old car ~ed up the hill.)***
(ب) هەڵبەز و دابەز کردن؛ بەملاو بەولادا هاتن.
(٤) ژان گرتنی ئافرەت پێش منداڵبوون.
***v.t.*** درێژەپێدان؛ زۆر لەسەر ڕۆیشتن؛ لە تام کردنە دەرەوە:
***( Do not ~ the point.)***

**laboratory** (lab'rə-tôr'i, lab'ēr-ə-tō'ri), ***n.*** تاقیگە؛ تاقیخانە؛
زەمونگە.
***adj.*** لە تاقیگەدا کراو؛ تاقیگەیی.

**Labor Day,** جەژنی کرێکاران.

**labored** (lā'bērd), ***adj.*** (١) هێواش و گران و بە ئازار و ماندووکەر:
***( ~ breathing)***.
(٢) دەستکرد؛ ناسرووشتی: ***( a ~ style of writing)***.

**laborer** (lā'bēr-ēr), ***n.*** کرێکار؛ کارگەر؛ ئیشکەر؛ فرمانکەر.

**laborious** (lə-bôr'i-əs, lə-bō'ri-əs), ***adj.*** (١) گران؛ قورس؛
ناخۆش (کار)؛ زەحمەت. (٢) زۆر ئیشکەر؛ کۆششکەر؛ زۆر ڕەنجدەر.

**laborite** (lā'bēr-īt'), ***n.*** (١) ئەندام یا پشتگیرێکی حیزبی کرێکاران.
(٢) [L-]، ئەندام یا پشتگیرێکی حیزبی کرێکارانی ئینگلتەرە.

**labor party,** (١) حیزبی کرێکاران. (٢) حیزبی کرێکارانی ئینگلتەرە.

**labor-saving** (lā'bēr-sāv'iŋ), ***adj.*** ئەرك کەمکەرەوە (ئامێر):
***( a ~ device)***

**labor union,** یەکێتی کرێکاران؛ جڤاتی کرێکاران.

**labour** (lā'bēr), ***n., v.t. & v.i.*** = **labor.** [British Spelling].

**labyrinth** (lab'ə-rinth'), ***n.*** (١) ڕێگە یا شوێنێکی پڕ لە پێچ‌وپەنا
(کە مرۆڤ وون تێیدا ببێ)؛ پێچ و پەنا؛ ڕێ وونە
(٢) کاروبارێکی ئاڵۆز. (٣) گوێی ناوەوە.

**labyrinthian** (lab'ə-rin'thi-ən), ***adj.*** = **labyrinthine.**

**labyrinthine** (lab'ə-rin'thin), ***adj.*** (١) پڕ لە پێچ و پەنا؛
پێچ و پەنادار. (٢) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو؛ سەرسوڕمێنەر.

**lace** (lās), ***n.*** (١) قەیتان (پێڵاو، جل توندکردنەوە)؛ بەن؛ بەنەخوێن.
(٢) شریت، قەیتان، یا بەنۆکەی جل پێ ڕازێنەرەوە (بەتایبەتی بەرگی ئەفسەر).
(٣) نەقش (جل‌وبەرگ، دەسەسڕ، مێتیل)؛ نەقشکاری.
(٤) قومێك لە خواردنەوەی سەرخۆشکەر کە دەکرێتە چا و قاوەوە
***v.t.*** (١) قایم کردن بە قەیتان یا بەن؛ پێکەوەبەستن؛ توندکردنەوە.
(٢) ( **up** ~ )، کەمەربەند توندکردنەوە (بۆ ناوقەد و سك تەسك کردنەوە).
(٣) چنین؛ لەیەك هەڵکێشان.
(٤) ڕازاندنەوە بە نەقش و شریتی جوان؛ نەقشکاری کردن.
(٥) بیرازکردن؛ دارکاری کردن؛ تێهەڵدان.
(٦) قومێك خواردنەوەی سەرخۆشکەر کردنە ناو چا و قاوەوە.
***v.i.*** قایم بوون یا بەستران بە قەیتان.
lace into, [Colloq.], (١) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان
(٢) هێرش بردنە سەر بە دەم؛ سەرزەنشتکردن.

**lacerate** (las'ə-rāt'), ***v.t.*** (١) کوتانەوە و شینکردنەوەی پێست و لەش:
بڕین (پێست)؛ بریندارکردن. (٢) هەست بریندارکردن؛ هەست ئازاردان
***adj.*** (١) کوتراوە و شین بووەوە (پێست، لەش)؛ بریندارکراو؛ بریندار.
(٢) قەراغ گرنج گرنج (گەڵا).

**-laceration** ***(n.).***

**lacertilian** (las'ēr-til'i-ən), ***adj.*** تایبەتی بە هەندێ گیانداری
خشۆك.
***n.*** گیاندارێکی خشۆك (وەك مارمێلکە).

**lacework** (lās'wūrk'), ***n.*** نەقش و نیگار.

**laches** (lach'iz), ***n.*** فەرامۆشی (بەتایبەتی لە داواکردنی مافی خۆ
لەکاتی خۆیدا)

**lachrymal** (lak'rə-m'l), ***adj.*** فرمێسکی؛ تایبەتی بە فرمێسك.
***n.*** (١) دەفرێکی بچووکە لە گۆڕە کۆنەکانی ڕۆمانەکاندا دۆزراوەتەوە، گوایە بۆ
فرمێسکی شیوەن کەران بووە. (٢) (*pl.*)، لووی فرمێسك ڕێژ.

**lachrymose** (lak'rə-mōs'), ***adj.*** (١) گرینۆك؛ چاو بە فرمێسك؛
زۆر فرمێسك ڕێژ. (٢) هێنەرە گریان؛ غەمگین؛ فرمێسك پێ ڕێژ.

**lack** (lak), *n.* (١) کەمی؛ کەموکووڕی؛ بەش نەکردن
(٢) نەبوون؛ هیچ نەبوون؛ نەبوونی؛ بێ. (٣) شتی کەم، نەبوو، یا پێویست.
*v.i.* (١) کەم بوون، بەش نەکردن؛ کەموکووڕی بوون.
(٢) نەبوون؛ دەست نەکەوتن.
*v.t.* (١) نەبوون؛ هیچ نەبوون. (٢) پێویست بوون.
**lackadaisical** (lak´ə-dā′zi-k'l), *adj.* بێ تاقەت؛ ماندوو؛ بێ هێز؛
سست؛ تەمەڵ؛ بێباك؛ نازدار؛ خۆ بەناز فرۆش.
**lackey** (lak′i), *n.* (١) بەردەست.
(٢) نۆکەر؛ کلك؛ دەسکەلا؛ بە کرێ گیراو: ***( a ~ of imperialism)*** .
*v.t. & v.i.* نۆکەری کردن
**lackluster, lacklustre** (lak′lus´têr), *adj.* مردوو (هەست،
ڕەنگ)؛ بێ هەست، بێ ڕەنگ؛ بێ بریقە؛ بێ جۆش: ***( ~ eyes)*** .
**laconic** (lə-kon′ik), *adj.* کورت و پڕ مانا، کورت؛ کەم دوو؛ نەدوو:
***( a ~ person, answer, style, etc.)***
-laconically *(adv.)*; laconicism *(n.)*; laconism *(n.)*.
**lacquer** (lak′ēr), *n.* (١) جۆرە بۆیەیەکە.
(٢) پارچەیەك شتی ڕازێنەرەوەی دارین کە بەم بۆیەیە بۆیە کرابێ.
*v.t.* بۆیەکردن بەم جۆرە بۆیەیە.
**lacrimal** (lak′rə-m'l), *adj. & n.* = **lachrymal.**
**lacrimose** (lak′rə-mōs´), *adj.* = **lachrymose.**
**lacrosse** (lə-krôs′, lə-kros′), *n.* یارییەکی دە یاریکەرییە لە
هەر تیپێکدا، هەر تیپێك هەوڵ دەدات بە ڕاکێتی دەسك درێژەوە تۆپەکە بکات بە
کۆڵی تیپی بەرامبەریدا
**lactate** (lak′tāt), *v.i.* (١) هاتنە شیر؛ شیردان؛ شیر دەردان.
(٢) مەمك پێدان؛ شیرپێدان.
*n.* خوێی ترشەڵۆکی شیر
-lactation *(n.)*.
**lacteal** (lak′ti-əl), *adj.* (١) شیری؛ وەك شیر؛ تایبەتی بە شیر.
(٢) تایبەتی بە دەماری "کیلۆس" بەر ("کیلۆس" خواردەمەنی پەلەخوردکراوە
کە وەك شلەی شیری وایە)
*n.* دەماری "کیلۆس" بەر
**lacteous** (lak′ti-əs), *adj.* شیری؛ لە شیر چوو.
**lactescent** (lak-tes′'nt), *adj.* (١) شیری؛ لە شیر چوو
(٢) وەك شیر لێ هاتوو (٣) شیلە یا شیرە دەردەر (ڕووەك).
-lactescence *(n.)*.
**lactic** (lak′tik), *adj.* شیری؛ لە شیر وەرگیراو؛ شیر.
**lactiferous** (lak-tif′ēr-əs), *adj.* شیردەر؛ شیربەر؛ شیردەردەر.
**lacto-** (lak′tō, lak´tə), پێشگرێکە بەمانای: شیری.
**lactobacillus** (lak´tō-bə-sil′əs), *n.* بەکتریای ترشێنەر؛ بەکتریای
درووستکەری ترشی لاکتیك؛ واتە ترشی شیر.
**lactose** (lak′tōs), *n.* لاکتۆز: شەکری شیر
**lacuna** (lə-kū′nə), *n.* بۆشایی؛ کون؛ کەلەبەر؛ درز؛ چاڵایی.
-lacunal *(adj.)*; lacunar *(adj.)*.
**lacunar** (lə-kū′nēr), *n.* (١) بنمیچی چاڵ چاڵی ڕازاوە.
(٢) یەکێك لەم چاڵە ڕازاوانەی بنمیچ.
**lacy** (lās′i), *adj.* نەقش و نیگاری ناسکدار.
**lad** (lad), *n.* (١) کوڕ؛ لاو؛ هەرزە. (٢) پیاو؛ کابرا (لە ڕووی دۆستییەوە)
**ladder** (lad′ēr), *n.* (١) پەیژە.
(٢) هۆی پێشکەوتن یا بەرزبوونەوەی بەرەبەرە: ***( the ~ of success)*** .
**lade** (lād), *v.t. & v.i.* (١) بار لێ بارکردن؛ بار لێنان؛ بارکردن.
(٢) ئاوهەڵهێنجان بە چەمچە یا سەتڵ؛ ئاو یا شلە دەردان.
**laden** (lād′'n), *alternative past participle of* **lade.**
*adj.* (١) بار لێنراو؛ بارکراو؛ پڕ.
(٢) تووش بوو؛ بارگران؛ گرفتار: ***( ~ with pain)*** .
**laden** (lād′'n), *v.t. & v.i.* = **lade.**

**lading** (lād′iŋ), *n.* (١) بارکردن؛ بار لێنان؛ بار لێ بارکردن. (٢) بار.
**ladle** (lā′d'l), *n.* چەمچە؛ ئەسکوێ.
*v.t.* هەڵهێنجان بە چەمچە؛ شلەو ئاو دەردان یا هەڵهێنجان بە چەمچە.
**ladleful** (lā′d'l-fool´), *n.* پڕ بە چەمچەیەك.
**lady** (lā′di), *n.* (١) خان؛ خاتوون؛ خاتوو؛ بانوو؛ خانم.
(٢) ئافرەت؛ ژن. (٣) دڵدار؛ یار؛ خۆشەویست.
(٤) ژن؛ خێزان؛ هاوسەر.
(٥) [L-]، مریەم (دایکی عیسا): ***( Our L~ )*** .
(٦) [L-]، نازناوی ئافرەتێکی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی بەرز.
*adj.* (١) مێ؛ مێینە؛ ژن: ***( a ~ barber )*** .
(٢) بۆ ئافرەت شیاو؛ هی ژن؛ ژنانە.
**ladybird** (lā′di-bûrd´), *n.* = **ladybug.**
**ladybug** (lā′di-bug´), *n.* خانخالۆکە.
**lady in waiting,** کارەکەری شاژن یا کچە پاشا.
**lady-killer** (lā′di-kil´ēr), *n.* [Slang], دڵفڕێنی ئافرەت؛
پیاوێك کە زۆر ژن حەزی لێ بکەن و بۆی بە تاسەوە بن؛ ژن کوژ.
**ladylike** (lā′di-līk´), *adj.* خانمانە؛ خاتوونانە؛
ڕەوشت جوان (ئافرەت).
**ladyship** (lā′di-ship´), *n.* (١) خانمێتی؛ پلەوپایەی خاتوونێتی.
(٢) [L-]، خانم؛ خاتوون؛ خاتوو؛ نازناوی ئافرەتێکی پلەوپایەدار.
**lag** (lag), *v.i.* دواکەوتن؛ بەجێمان؛ زۆر پێچوون؛ خۆ بە قنگدا خستن.
*n.* (١) دواکەوتن؛ بەجێمان. (٢) ماوەی دواکەوتن یا بەجێمان.
**lag behind,** دواکەوتن؛ بەجێمان؛ پێنەگەیشتن.
**lag** (lag), *n.* پەل یا پەراسووی بەرمیل.
**lag** (lag), *v.t.* (١) ناردن بۆ ئۆردوگای بێگاری یا بەندیخانە.
(٢) گرتن؛ بەندکردن.
*n.* [Slang], (١) تاوانباری ناو ئۆردوگای بێگاری؛ تاوانبار.
(٢) ماوەی بەندیتی لە بێگارخانەدا.
**lagan** (lag′ən), *n.* باری لە کەشتی فڕێدراو لە باوبۆراندا پاش بەستنی
بە شتێکی سەرئاوکەوتووەوە بۆ دەرهێنانەوەی لە دواڕۆژدا.
**laggard** (lag′ērd), *n.* کەسێکی سست و هەمیشە دواکەوتوو.
*adj.* دواکەوتوو؛ سست؛ خاو.
**lagger** (lag′ēr), *n.* کەسێك یا شتێکی سست و دواکەوتوو.
**lagoon** (lə-gōōn′), *n.* گۆم، دەریاچە، یا زەلکاوێك کە نزیك بێ لە
دەریاوە یا ئاوەکەی لەوێوە هاتبێ.
**laic** (lā′ik), *adj.* تایبەتی بە جەماوەری خەڵك جگە لە شێخ و مەلاو
پیاوە ئاینییەکان؛ هی خەڵکی ڕەمەکی و دوور لە ئاین.
*n.* = **layman.**
-laical *(adj.)*.
**laicize** (lā′ə-sīz´), *v.t.* لە ژێر دەستی ئاین و پیاوە ئاینییەکان
دەرهێنان؛ ڕەمەکی کردن.
**laid** (lād), *past tense and past participle of* **lay.**
**lain** (lān), *past participle of* **lie.**
**lair** (lâr), *n.* لانە؛ نیشتەجێی گیاندارێکی کێوی.
**laissez-faire** (les´ā-fâr′), *n.* بەرەڵایی (بەتایبەتی لە کاروباری
بازرگانی و کاروکاسبیدا)؛ سەربەستی دان بە دەزگاکانی بازرگانی و کاروکاسبی
و دەست نەخستنە کاروباریانەوە لەلایەن میرییەوە؛ دەست نەهێنانە ڕێ.
**laissez-passer** (les′ā-pas′ēr), *n.* پەساپۆرت.
**laity** (lā′ə-ti), *n.* (١) جەماوەری خەڵك جگە لە شێخ و مەلاو پیاوە-
ئاینییەکان. (٢) بۆرە پیاوان؛ تێکڕای خەڵکی ڕەمەکی یا ئەوانەی کە
پیشەیەکی وەهایان نییە کە شارەزایییەکی تایبەتی بوێت.
**lake** (lāk), *n.* (١) گۆم؛ دەریاچە. (٢) گۆمە نەوت یا شلەی تر.
**lake** (lāk), *n.* (١) بۆیەیەکی سووری تۆخ. (٢) ڕەنگی ئەم بۆیەیە.
**lam** (lam), *n. & v.i.* [Slang], ڕاکردن لە ترسی سزا؛ دەربازبوون.
**on the lam,** [Slang], لە ڕاکردندا لە ترسی سزا.

**take it on the lam,** [Slang], ڕاکردن له ترسی سزا؛ دەربازبوون.
**lama** (lä′mə), ***n.*** ووشکەسۆفییەکی بوودی له تبت و مەنگۆلیا.
**lamasery** (lä′mə-ser′i), ***n.*** پەرستگا یا نشینگای ووشکەسۆفییانی بوودی.
**lamb** (lam), ***n.*** (١) بەرخ؛ کاوڕ؛ مەڕ. (٢) گۆشتی بەرخ، کاوڕ، یا مەڕ.
(٣) پێستی بەرخ و کاوڕ و مەڕ.
(٤) کەسێکی بەسزمان و بێ تاوان بەتایبەتی منداڵێك.
(٥) کەسێکی ساویلکە.
***v.i.*** زاین (مەڕ)؛ بەرخ بوون.
**like a lamb,** (١) بەسزمانانە؛ بە ترسەوە؛ بەسزمان. (٢) ساویلکە.
**the Lamb,** عیسا
**lambaste** (lam-bāst′), ***v.t.*** (١) بیزارکردن؛ دارکاری کردن؛ کوتان.
(٢) سەرزەنشتکردن
**lambkin** (lam′kin), ***n.*** بەرخۆلە (هەندێ جار بە منداڵ دەووترێ).
**lamblike** (lam′līk′), ***adj.*** بەسزمان؛ ساویلکە؛ وەك مەڕ
**Lamb of God,** عیسا
**lambskin** (lam′skin′), ***n.*** (١) پێستەی بەرخ و مەڕ بەتایبەتی بە خورییەکەیەوە. (٢) چەرمی بەرخ و مەڕ
**lame** (lām), ***adj.*** (١) شەل؛ لەنگ.
(٢) ڕەق بوو بە ئێش وئازار.
(٣) هیچ وپووچ؛ کەس پێ نەسەلمێنراو؛ کەس پێ بڕوانەکەر؛ قەلب؛ بێ فەڕ:
*( a ~ excuse)*
***v.t. & v.i.*** شەل کردن؛ شەل بوون؛ لە کەڵك خستن.
**lame duck,** (١) کەسێکی پەککەوتە، زەبوون، دەستەپاچە، یا ناکارامە؛ شتێکی کەڵك نەماو. (٢) ئەندامێکی پەرلەمان یا سەرەك کۆمارێك کە هەڵنەبژێرابێتەوە بۆ کایەیەکی تازە یا خۆی خانەنشین کردبێ، بەڵام هێشتا ماوەیەکی مابێ لەسەر کار.
**lament** (lə-ment′), ***v.i.*** شیوەن کردن؛ شین کردن؛ کڕووزانەوە؛ زۆر پێ ناخۆش بوون.
***v.t.*** (١) شیوەن بۆ کردن؛ شین بۆ کردن؛ بۆ گریان؛ زۆر پێ ناخۆش بوون.
(٢) زۆر پەشیمان بوونەوە.
***n.*** (١) شین؛ شیوەن؛ لاوانەوە؛ سکاڵا؛ سکاڵاوگریان؛ کڕووزاندنەوە.
(٢) هەڵبەستی شیوەن (وێژە یا مۆسیقا).
**lamentable** (lam′ən-tə-b'l), ***adj.*** (١) جێی پەشیمانییە؛ جێی داخە؛ ناخۆش. (٢) دڵگیر؛ شیوەنی.
(٣) قەلب؛ خراپ؛ بێ فەڕ؛ هیچ وپووچ: *( a ~ piece of acting)* .
**-lamentably** *(adv.).*

**lamentation** (lam′ən-tā′shən), ***n.*** شیوەن؛ شین؛ وارەیلێ؛ لاوانەوە؛ سکاڵا؛ سکاڵاوگریان؛ ڕۆڵە ڕۆ.
**lamia** (lā′mi-ə), ***n.*** (١) دەعبایەکی ئەفسانەیی خوێنمژە.
(٢) گیاندارێکی خوێنمژ؛ جنۆکەی مێینە؛ ئەفسوونگەر.
**lamina** (lam′ə-nə), ***n.*** (١) تەبەقێکی تەنك؛ توێ؛ چین.
(٢) لەپی گەڵا؛ گەڵای درەخت بێجگە لە قنچکەکەی.
**laminate** (lam′ə-nāt′), ***v.t.*** (١) کردن بە تەبەق یا توێیەکی تەنك.
(٢) چین چین کردن؛ توێ توێ کردن. (٣) بە توێی تەنك داپۆشین.
(٤) بە توێ توێی تەنك دروستکردن.
(٥) پێکەوەنووساندن بە پەستاندنەوە.
***adj.*** توێ توێ؛ چین چینی تەنك.
**laminated** (lam′ə-nā′tid), ***adj.*** (١) توێ توێ؛ کراوە بە چین چینی تەنك. (٢) پێکەوە نووسێنراو یا پەستێنراوە (پێناس).
**lamination** (lam′ə-nā′shən), ***n.*** (١) توێ توێ کردن؛ چین چینی تەنك کردن. (٢) شتێکی توێ توێ یا چین چینی تەنك.
(٣) توێ چینی تەنك.
**lammergeier, lammergeyer** (lam′ēr-gī′ēr), ***n.*** داڵاش

**lamp** (lamp), ***n.*** (١) (ا) چرا؛ لەمپا. (ب) گولۆپ.
(٢) سەرچاوەی زانست و ژیری و دانایی.
(٣) [Poetic]، خۆر؛ مانگ؛ ئەستێرە.
(٤) [Slang] (*pl.*)، چاو
***v.t.*** [Slang], تەماشاکردن؛ سەیرکردن.
**lamplight** (lamp′līt′), ***n.*** شەوقی چرا؛ ڕووناکی چرا.
**lampoon** (lam-pōōn′), ***n.*** داشۆری؛ بەدگۆیی (بە نووسین).
***v.t.*** داشۆری کردن؛ داشتن؛ بەدگۆیی کردن لە وێژەدا
**-lampooner** *(n.)*; **lampoonery** *(n.)*; **lampoonist** *(n.)*.

**lamppost** (lamp′pōst′), ***n.*** ستوونی کارەبا یا چرای سەر ڕێ.
**lance** (lans, läns), ***n.*** (١) نێزە؛ ڕم. (٢) سەربازی سوارەی تیرەوان.
(٣) تیری ڕاوە نەهەنگ یا ماسی. (٤) چەقۆی دوو دەمی نەشتەرکاری.
***v.t.*** (١) ڕم پیاکردن؛ هێرش بردنە سەر بە نێزە.
(٢) هەڵدڕین بە چەقۆی دوو دەمی.
**lance corporal,** سەربازی جێگری سەرۆك (سوپای ئینگلیزی)
**lancer** (lan′sēr, län′sēr), ***n.*** تیرەوان؛ سەربازی سوارەی تیرەوان.
**lancers** (lan′sērz, län′sērz), ***n.pl.*** (١) جۆرە سەمایەکە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**lancet** (lan′sit, län′sit), ***n.*** (١) چەقۆی دوو دەمی نەشتەرکاری
(٢) پەنجەرەی بارێکی بەرزی سەر تیژی ناو تاق.
**lancet window,** پەنجەرەی بارێکی بەرزی سەر تیژی ناو تاق
**lancinate** (lan′sə-nāt′), ***v.t.*** بریندارکردن (مەجازی)
**land** (land), ***n.*** (١) زەمین؛ ووشکانی. (٢) (ا) وڵات؛ خاك.
(ب) گەل؛ میللەت؛ دانیشتوانی خاکێك.
(٣) زەوی؛ زەویوزار: *( rich ~ )* .
(٤) خانووبەرە؛ زەویوزار: *( L~ is a good investment.)* .
(٥) (*pl.*) موڵك. (٦) لادێ. (٧) سەرمایەی سرووشتی ژێرزەمین و سەرزەمین.
***v.t.*** (١) دابەزین لە کەشتی؛ گەیشتنە ووشکانی.
(٢) گەیاندن؛ بردن:
*( This train will ~ you in NewYork tomorrow.)*
(٣) گیرساندنەوە *( This fight ~ed them both in jail.)*
(٤) نیشاندنەوە: *( The pilot ~ed the plane safely.)* .
(٥) هێنانە ناو بەلەم یا سەر ووشکانی:
*( He ~s the fish wich she hooks.)*
(٦) [Colloq.]، دەسکەوتن؛ دەزگیربوون: *( He ~ed a job.)* .
(٧) [Colloq.]، پیادان؛ پیاکێشان: *( He ~ed a punch on his face.)*
***v.i.*** (١) لە کەشتی دابەزین. (٢) گەیشتنە بەندەر (کەشتی).
(٣) گەیشتن. (٤) گیرسانەوە.
(٥) نیشتنەوە (فڕۆکە، باڵندە) *( The plane ~ed in London.)*
**make land,** گەیشتنە کەناری دەریا یا ووشکانی
**landau** (lan′dô, lan′dou), ***n.*** (١) عەرەبانەیەکی چوارپێچکەی سەرگیراوی دوو بەش. (٢) ئوتومبیلێکی کۆنباوی بەم شێوەیە.
**landed** (lan′did), ***adj.*** (١) خاوەن زەویوزار: *( ~ gentry )* .
(٢) لە خانووبەرە و زەویوزار پێکهاتوو: *( a ~ estate)* .
**landfall** (land′fôl′), ***n.*** (١) بەدیکردنی ووشکانی لە کەشتی یا فڕۆکەوە. (٢) ئەم ووشکانییە بەدیکراوە.
**land grant,lands** بەخشینی زەویوزار لەلایەن میرییەوە بە زانکۆ و دانشگاو دەزگای کۆمەڵایەتی و گشتی.

**landholder** (land′hōl′dēr), ***n.*** خاوەن زەویوزار؛ زەویدار
**landing** (lan′diŋ), ***n.*** (١) نیشتنەوە؛ گەیشتنە بەندەر یا ووشکانی.
(٢) جێی بارکردن و بارداگرتنی کەشتی.les
(٣) تەختایی سەر تەوقەسەری ڕیزە پێ پلیکانە.
(٤) دابەزین؛ گیرسانەوە.

**landing field,** فرکە؛ فرۆکەخانە

**landing gear,** ئامێری فرۆکە پێ نیشتنەوە.

**landlady** (land′lā′di), *n.* (١) خاوەن خانووی بە کرێ دراو (ژن).

(٢) بەڕێوەبەری ئوتێل یا خانووی بە کرێ دراو (ژن).

**landless** (land′lis), *adj.* خاوەنی زەویوزار نەبوو.

**landlocked** (land′lokt′), *adj.* (١) بە وشکانی دەورەدراو:

*( a ~ country)*

(٢) لە دەریا دابڕاوو قەتیس بوو لە جۆگەو ڕوباردا (ماسی): *( the ~ salmon)*

**landloper** (land′lō′pēr), *n.* کەسێکی بێ لانەی دەربەدەری گەڕۆك.

**landlord** (land′lôrd′), *n.* (١) دەرەبەگ؛ خاوەن زەویوزار؛

خاوەن موڵك و خانووی بە کرێ دراو.

(٢) بەڕێوەبەری ئوتێل یا خانووی بە کرێ دراو.

**landlubber** (land′lub′ēr), *n.* وشکانی نشین و نەشارەزای ژیانی

دەریایی کەشتیەوان لە ڕووی سووکیەوە بە خەڵکی تری دەڵێن).

**landman** (land′mən), *n.* وشکانی نشین.

**landmark** (land′märk′), *n.* (١) نیشانەی سنوور:

سنوور دیاریکەری زەوی، ناوچە، یا شوێنێك (٢) (ا) نیشانەی سەر ڕێگا

(کە ڕێبوار ڕێگەی پێ دەناسێتەوە)؛ نیشانەی ڕێنوما.

(ب) شتێکی زۆر لەبەرچاو کە شوێنێکی پێوە بناسرێت (خانوو، دار):

*( Their house was a ~ in the town.)*

(٢) گۆڕیس یا ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ:

*( ~s in the history of civilization)*

**land mine,** مینی ژێرزەوی؛ تەقەمەنی ژێرزەوی.

**land-owner** (land′ōn′ēr), *n.* خاوەن زەویوزار؛ خاوەن موڵك؛

**-landownership** *(n.).* دەرەبەگ

**landscape** (land′skāp′), *n.* (١) دیمەنی دەشتودەر.

(٢) (ا) وێنەیەکی دیمەنی دەشتودەر (ب) هونەری وێنەگرتن و نیگارکێشانی

دیمەنی جوانی دەشتودەر.

*v.t.* ڕێك کردن و جوانکردنی دیمەنی زەمینی دەوروپشتی خانوو (بە دارو

چیمەن تیا ناشتن و نەخشەکێشانی).

*v.i.* کارکردن لە نەخشەکێشان و جوانکردنی زەمینی دەوروپشتی خانوو.

**landscape architect,** نەخشەکێشی جوانکردنی زەمینی

دەوروپشتی خانوو

**landscape architecture,** نەخشەکێشانی جوانکردنی زەمینی

دەوروپشتی خانوو.

**landslide** (land′slīd′), *n.* (١) هەرەس بردنی قەدپاڵێك؛

هەرەس هێنان (٢) بەردو خاك و خۆڵی هەرەس بردوو

(٣) (ا) وەرگرتنی زۆربەی دەنگ لە هەڵبژاردنێکدا.

(ب) بردنەوەیەکی گەورەی هەڵبژاردنێك: *( The election was a ~.)* .

(ج) بردنەوەیەکی گەورە.

**landsman** (landz′mən), *n.* (١) وشکانی نشین.

(٢) کەشتیەوانێکی تازەو نەشارەزا

**lane** (lān), *n.* (١) باریکەڕێ (بەتایبەتی لە لادێ دا کە ئەم دیوو ئەو دیوی

پەرژین بێت. (٢) کۆڵان؛ کووچە. (٣) ڕاڕەوی نێوان ڕیزە خەڵکی وەستاو.

(٤) ڕێگەی دەریایی یا هەوایی دیاریکراو بۆ کەشتی و فرۆکە؛

هێڵی دەریایی و هەوایی: *( sea ~s)*

(٥) هێڵ خانە (هاتوچۆی ئوتومبیل لە شەقام و ڕێگەوباندا):

*( traffic ~s; a four- ~ highway.)*

(٦) هێڵ خانە. یا ڕێبازی دیاریکراو بۆ پێشبڕکێکەرێك (مەلەکردن، ڕاکردن،

سەوڵ لێدان... هتد)

**language** (laŋ′gwij), *n.* (١) زمان؛ زبان:

*( The English ~; foreign ~s)*

(٢) شێوازی زمان بەکارهێنان و هەست دەربڕین

*( a person with a great command of ~; strong ~ )*

(٣) زمانی پیشەیەکی تایبەتی: *( technical ~; the ~ of diplomacy)* .

(٤) زمانی نیشانەیی بە دەست و پەنجە: *( deaf-and-dumb ~ )* .

**languid** (laŋ′gwid), *adj.* (١) بێ هێز؛ لاواز؛ پووکاوە

(٢) سارد (مەجاز)؛ بێ تاقەت؛ ماندوو. (٣) سست؛ خاو؛ هێواش

**languish** (laŋ′gwish), *v.i.* (١) پووکانەوە؛ لاواز بوون؛ هێز لێ بڕان.

(٢) چەوسانەوە؛ پووکانەوە لە خەم و خەفەت و برسێتیدا: *( ~ing in prison)*

(٣) خاوبوونەوە؛ سست بوون؛ ساردبوونەوە.

(٤) بە تاسەوە بوون بۆ؛ خەفەت بۆ خواردن؛ خۆزگە بۆ خواردن و پێوە ناڵاندن:

*( He ~ed for her)*

(٥) نواندنی هەست ناسکی و خەمباری و خۆشەویستی بە سەرزاری.

**-languisher** *(n.)*; **languishment** *(n.).*

**languishing** (laŋ′gwish-iŋ), *adj.* (١) لاواز؛ بێ هێز؛ ماندوو.

(٢) زۆر خایەن؛ زۆر پێچوو (٣) خاو؛ سست؛ هێواش.

(٤) بەتاس؛ خۆزگەخواز

(٥) ناسك؛ پڕ لە خۆشەویستی و بۆ بەتاسەوەبوون: *( a ~ eye, look, etc.)*

**languor** (laŋ′gēr), *n.* (١) بێ هێزی؛ لاوازی.

(٢) بێ تاقەتی؛ ساردی؛ گوێ نەدان. (٣) هەست ناسکی.

(٤) سستی؛ خاوی؛ هێواشی.

(٥) ناخۆش و دڵتەنگکەر (ئاووهەوا)؛ قورس.

**languorous** (laŋ′gēr-əs), *adj.* (١) بێ هێز؛ لاواز. (٢) خاو؛ سست.

(٣) سستکەر؛ هێواش کەرەوە؛ خاوکەرەوە

**langur** (luŋ-gōōr′), *n.* جۆرە مەیموونێکی کلك درێژی بڕۆ پڕە.

**lank** (laŋk), *adj.* (١) باریکەلە (مرۆڤ)؛ ڕیوەڵە؛ باڵا بەرز و باریك؛ ڕەقەڵە.

(٢) خاو (قژ)؛ درێژو خاو.

**lanky** (laŋ′ki), *adj.* ڕیوەڵە؛ ڕەقەڵە؛ باریك و درێژ؛ باریکەلە؛

باریك و ناشرین: *( a ~ boy, tree, etc.)* .

**-lankily** *(adv.)*; **lankiness** *(n.).*

**lanner** (lan′ēr), *n.* (١) جۆرە هەڵۆیەکە؛ هەڵۆ.

(٢) مێینەی ئەم هەڵۆیە (ڕاوی پێ دەکرێت).

**lanneret** (lan′ēr-et′), *n.* نێرە هەڵۆ (وشەی پێشوو ببینە).

**lantern** (lan′tērn), *n.* (١) چرا؛ لەمپا؛ لۆکس؛ فانۆس؛ شووشەی چرا

یا لەمپا. (٢) ژووری چرای سەر بورجی ڕووناکی بۆ ڕێ پیشاندانی کەشتی و

کەشتیەوان لە کەناری دەریادا. (٣) کلاوڕۆژنە.

(٤) چرای ئەفسوونەیی؛ فانۆسی ئەفسوونەیی.

**lap** (lap), *n.* (١) دامێنی کراس و کەوا. (٢) کۆش.

(٣) چمکە کراس (بۆ شت هەڵگرتن). (٤) باوەش؛ باووش.

(٥) (ا) سەریەك چوون. (ب) توێی سەر یەك چوو.

(ج) مەودای سەر یەك چوون. (٦) خول (گۆمی مەلە، ڕاکردن لە یاریگادا)؛

سووڕ؛ چەرخە (٧) پێچ (گوریس بە دەوری سنگ یا مێخدا).

(٨) ئامێری بڕین و ساف و لووس کردنی بەردی بەنرخ

*v.t.* (١) پێچانەوە؛ قەدکردن.

(٢) گرتنەباوەش؛ دەورەدان؛ دەورگرتن: *( He was ~ped in luxury.)*

(٣) سواری یەکتر کردنی دوو شت یا زیاتر بە جۆرێك کە سەری شتەکەی

سەرەوە لەوەی ژێرەوە تێپەڕ ببێت (وەك پوولەکەی ماسی):

*( You must ~ the second board over the first.)*

(٤) تێپەڕبوون (سەری شتێکی دانراو لە سەری شتەکەی ژێری)

(٥) بڕین یا ساف و لووس کردن بە ئامێری تایبەتی (بەردی بەنرخ).

(٦) خول یا سووڕخواردنێك زیاتر لە کەسەکەی تر (پێشبڕکێی مەلە و ڕاکردن).

*v.i.* (١) پێچرانەوە؛ قەدکران. (٢) دانرانی دوو شت لەسەر یەکتری بە جۆرێك کە

سەری ئەوەی سەرەوە لەوەی ژێرەوە تێپەڕ ببێت.

**in the lap of luxury,** لە خۆش گوزەرانیدا؛ لە خێرو خۆشیدا.

**in the lap of gods,** لە دەست خودادایە؛ لە دەستی ئادەمیزاددا نییە.

**lap** (lap), *v.i. & v.t.* (١) ئاو خواردنەوە وەك سەگ؛ شڵپ وهووڕ لێ

هەڵساندن؛ بە شڵپە شڵپ خواردنەوە. (٢) لستنەوە (مەجاز)؛ شڵپە شڵپ کردن

(شەپۆل)؛ بە ئەسپایی پێداهێنان؛ پێداکێشان:

*( waves ~ping on the beach)*

***n.*** (١) خواردنەوەی بە شلپە شلپ وەك سەگ. (٢) شلپە : خواردنەوەی سەگ، شەپۆل)؛ شلپ‌وهووړ. (٣) شنێكی بە شلپە شلپ خوراوە.

**lap up,** (١) بە شلپە شلپ خواردنەوە یا خواردن (شلە، خواردنی شلەی وەك شۆربا)؛ هەڵ لووشین. (٢) [Colloq.]، هەڵ لووشین؛ قۆستنەوە؛ بە چاوبرسێتی‌یانە خواردن یا بردن بۆ خۆ.

**laparo-** (lap′ə-rə), پێشگرێكە بەمانای: لاقەبرغە؛ دیواری سك.

**laparotomy** (lap′ə-rot′ə-mi), ***n.*** سك هەڵدڕین لە لاوە یا لە هەر چ شوێنێكەوە بە نەشتەركاری.

**lap-board** (lap′bôrd′, lap′bōrd′), ***n.*** تەختەیەكی بچووكی سەركۆشی نووسینە (لەباتی مێز)

**lap dog,** سەگێكی بچووكی ناومالە (دەتوانرێت بخرێتە نار كۆشەوە).

**lapel** (lə-pel′), ***n.*** یەخەی چاكەت؛ بەرۆك؛ یەخەی بەر سنگی چاكەت.

**lapful** (lap′fool′), ***adj.*** پڕ كۆشێك؛ زۆر؛ فرە.

**lapidary** (lap′ə-der′i), ***n.*** (١) زەرەنگەر؛ كارگەری گەوهەرو بەردی بەنرخی تر. (٢) -ەلالی گەوهەرو بەردی بەنرخی تر.

***adj.*** (١) تایبەتی بە گەوهەرو شت لەسەر هەڵكەندنی؛ هی زەرەنگەری؛ هی هونەری لەسەر گەوهەر هەڵكەندن. (٢) لەسەر گەوهەر هەڵكەنراو. (٣) ئەوەندە باش و جوان و ئایابە شایستەی لەسەر گەوهەر هەڵكەندنە: *( ~ prose)*

**lapidate** (lap′ə-dāt′), ***v.t.*** (١) بەردە باران كردن. (٢) كوشتن بە بەردە باران.

**-lapidation** *(n.)*.

**lapillus** (lə-pil′əs), ***n.*** بەردێكی شووشەیی ئاگرپژێنی‌یە (ئەوەندەی گوێزێكە)

**lapin** (lap′in), ***n.*** (١) كەروێشك. (٢) كەوڵە كەروێشك.

**lapis lazuli** (lap′is laz′yoo-lī′), (١) لاجی وەرد: بەردێكی نیمچە بەنرخە. (٢) لاجی وەردی: شینی ئاسمانی.

**lappet** (lap′it), ***n.*** (١) چمكی رازێنەرەوەی بەرەلای جل‌وبەرگ یا سەرپێچ (وەك چمكی مشكی و جامانە). (٢) پارچە چەرم یا گۆشتی داكەوتوو (غەبغەبەی گاو مانگا، نەرمە گۆشتەی گوێ).

**lapse** (laps), ***n.*** (١) لە زمان دەرچوون؛ لە دەست دەرچوون؛ هەڵە؛ كەم‌وكووڕی؛ لەبیرچوون. (٢) دانەدواوە (رەووشت)؛ بێ رەووشتی نوان. (٣) نزم بوونەوە؛ پێ داچوون. (٤) فەوتان؛ وێران بوون. (٥) تێپەڕبوون (كات)؛ رابوردن؛ بەسەرچوون. (٦) (أ) دەست لە ماف هەڵگرتن یا مافێك لێ سەنرانەوە لەبەر جێبەجێ نەكردنی ئەركی سارشان و كەمتەرخەمی (ب) وەرنەگرتنی میراتی‌یەك لەبەر مردنی میراتبەرەكە

***v.i.*** (١) چوونە بارێكی تایبەتی‌یەوە؛ كەوتن: *( He ~d into unconsciousness.)* (٢) دانەدواوە (رەووشت)؛ پێ داچوون (رەفتار)؛ لە رێی راست لادان. (٣) تێپەڕبوون (كات)؛ رابواردن؛ بەسەرچوون. (٤) بەتال بوونەوە بەهۆی نەدانی مانگانە یا قیستەوە (بیمە). (٥) بوون بە موڵكی یەكێكی تر (لە ئەنجامی مردن یا كەمتەرخەمیدا).

**larboard** (lär′bērd, lär′bôrd′, lär′bōrd′), ***n.*** دەستەچەپی كەشتی یا فڕۆكەیەك (ئەگەر لە دواوە بووەستیت و سەیری پێشەوە بكەیت)؛ لاچەپی كەشتی و فڕۆكە.

***adj. & adv.*** تایبەتی بە دەستەچەپی كەشتی و فڕۆكە.

**larcener** (lär′sə-nēr), ***n.*** = **larcenist.**

**larcenist** (lär′sə-nist), ***n.*** دز.

**larcenous** (lär′sə-nəs), ***adj.*** دز؛ حەز لە دزی كەر

**larceny** (lär′sə-ni), ***n.*** دز؛ دزێتی؛ -دزین

**larch** (lärch), ***n.*** (١) درەختێكە لە توخمی سنەوبەر (٢) داری ئەم درەختە.

**lard** (lärd), ***n.*** بەزی بەراز؛ پیوی بەراز

***v.t.*** (١) بە بەزی بەراز چەوركردن؛ چەوركردن. (٢) توێ گۆشتی بەراز خستنە مریشك و گۆشتی گاوە پێش كوڵاندنیان. (٣) رازاندنەوە.

**larder** (lär′dēr), ***n.*** (١) گەنجینە. (٢) ئازووقە.

**lardon** (lär′dən), ***n.*** *Also* **lardoon,** توێ گۆشتی بەرازە كە دەخرێتە مریشك و گۆشتی گاوە پێش كوڵاندنیان.

**large** (lärj), ***adj.***. (١) (ا) بەخشندە؛ دەست و دڵ تێر؛ بدە: *( a ~ heart)* (ب) دەستبڵاو؛ پارە لە بەرد دەر. (٢) گەورە؛ زل؛ فراوان: *( a ~ room, office, house, etc.)*. (٣) زۆر: *( a ~ sum of money)* (٤) درشت؛ گەورە. (٥) گەورە؛ بە ئەندازەیەكی زۆر: *( a ~ manufacturer)*. (٦) بهات (با)؛ هات؛ باش. (٧) گشتی.

***adv.*** (١) بە زلی (نووسین)؛ بە گەورەیی. (٢) بە بای بهات یا باشەوە.

**at large,** (١) بەرەڵا (تاوانبار)؛ بەلەسە: *( The killer is still at large.)* (٢) بە دوورودرێژی؛ بە ووردی: *( He spoke at large on the housing problem.)* (٣) بە گشتی: *( the society at large)*. (٤) نوێنەری گشتی ناوچەیەك: *( a congressman at large)* (٥) گشتی؛ گەڕۆك (باڵیۆز): دانەنراوە بۆ وولاتێك بەڵكو هی گشتی‌یەو دەگەڕێت بە سەرەوە: *( ambassador at large)*.

**large-hearted** (lärj′här′tid), ***adj.*** بەخشندە؛ دەست و دڵ فراوان؛ بدە؛ هاوسۆز؛ بە بەزەیی.

**large intestine,** ریخۆڵە گەورە.

**largely** (lärj′li), ***adv.*** (١) زۆر؛ بە ئەندازەیەكی زۆر (٢) بە زۆری: *( His failure is due ~ to laziness.)*.

**large-minded** (lärj′mīn′did), ***adj.*** مێشك فراوان؛ مێشك كراوە

**large-scale** (lärj′skāl′), ***adj.*** (١) گەورە (نەخشە). (٢) مەودا گەورە؛ گەورە؛ بە ئەندازەیەكی زۆر: *( a ~ offensive, war, business operation, etc.)*

**largess, largesse** (lär′jis, lär′jes), ***n.*** بەخشش.

**lark** (lärk), ***n.*** كلاوكوڕە.

**lark** (lärk), ***v.i.*** [Colloq.], گاڵتەوگەپ كردن؛ یاری كردن

***v.t.*** [Colloq.], گاڵتەپێكردن؛ كلك پێوەكردن؛ سەرخستنەسەر.

***n.*** گاڵتەوگەپ؛ یاری؛ یاری سەیرو خۆش.

**larkspur** (lärk′spûr′), ***n.*** = **delphinium.**

**larva** (lär′və), ***n.*** كرمۆكە؛ بێچووە مێروو.

**-larval** *(adj.)*.

**laryngal** (lə-riŋ′gəl), ***adj.*** قوڕقوڕاگەیی؛ بینەقاقەیی؛ قوڕگی.

**laryngitic** (lar′in-jit′ik), ***adj.*** تایبەتی بە قوڕگ ئێشەو دەنگ نوسان؛ قوڕگ ئێشاو.

**laryngitis** (lar′in-jī′tis), ***n.*** قوڕگ ئێشە بە دەنگ نوسانەوە.

**laryng-, laryngo-** (lə-riŋ′gō, lə-riŋ′gə), پێشگرێكە بەمانای: (١) قوڕگ؛ قوڕقوڕاگە؛ بەربین. (٢) قوڕقوڕاگەیی؛ بەربینی؛ قوڕگی.

**laryngology** (lar′iŋ-gol′ə-ji), ***n.*** پزیشكەوانی قوڕگ.

**laryngotomy** (lar′iŋ-got′ə-mi), ***n.*** نەشتەركاری قوڕگ؛ قوڕگ هەڵدڕین (نەشتەركاری)

**larynx** (lar′iŋks), ***n.*** قوڕگ؛ قوڕقوڕاگە؛ بینەقاقا

**lasagna** (lə-zän′yə), ***n.*** لەزانیا: خواردەمەنی‌یەكی ئیتاڵی‌یە لە مەعكەرۆنی و گۆشتی كوتراو و دۆشاوی تەماتەو پەنیر دەكرێت لە فرندا

**lascivious** (lə-siv′i-əs), ***adj.*** هەوەس هەڵسێنەر؛ بە ئالۆش؛ چاوچڵێس (جووت بوون)؛ چاوباشقاڵ؛ بەرەڵا: *( a ~ look, act, novel, etc.)*

**-lasciviously** *(adv.)*; **lasciviousness** *(n.)*.

**laser** (lā′zēr), *n.* تیشکی "لەیزەر"

**lash** (lash), *n.* (١) قامچی قەمچی (٢) لێدانێك بە قامچی.
(٣) پلار؛ توانج؛ سەرزەنشتی؛ ووتەیەکی توندوتیژ
(٤) پیاکێشانێك (٥) برژانگ؛ برژانگێك.

*v.t.* (١) قامچی لێدان؛ دارکاری کردن؛ فەلاقە کردن.
(٢) ڕاوەشاندن *(an angry lion ~ing his tail)*.
(٣) پیادان بە قایم؛ پیاکێشان؛ لێدان *(The waves ~ed the cliffs.)*
(٤) هێرش کردنە سەر بە دەم؛ سەرزەنشتکردن؛ شکاندن
(٥) هێنانە جۆش؛ هاندان.

*v.i.* (١) ڕاوەشان (٢) لێدان؛ پیادان؛ پیاکێشان؛ پیامالین:
*(He ~ed at everything that came near.)*

**lash out,** (١) بە توند پیامالین؛ پیاکێشان؛ بە قایم لێدان.
(٢) هێرش بردنە سەر بە توندی بە دەم؛ بە توندی سەرزەنشتکردن؛ شکاندن:
*(to lash out at somebody)*

**lash** (lash), *v.t.* بەستنەوە بە پەت، گوریس، یا زنجیر.

**lashing** (lash′iŋ), *n.* (١) بە قامچی لێدان؛ دارکاری کردن.
(٢) هێرشی بە توندی بە دەم؛ سەرزەنشت: *(He got a tongue ~.)*.

**lashing** (lash′iŋ), *n.* (١) بەستنەوە (٢) پەت؛ گوریس.

**lass** (las), *n.* (١) کچ (٢) یار؛ دڵدار
(٣) کارەکەر

**lassitude** (las′ə-tōōd′, las′ə-tūd′), *n.* ماندوویەتی؛ پرووکان؛ بێ هەناوی؛ بێ تاقەتی؛ بێ هێزی.

**lasso** (las′ō), *n.* کەمەند؛ پەتێکی قوڵفەدارە ئەسپ و ڕەشەووڵاخی بەرەڵای پێ دەگیرێتەوە

*v.t.* بە کەمەند گرتنەوە؛ کەمەندکردن؛ کەمەند هاویشتن.

**last** (last, läst), *adj.* (١) دواهەمین؛ دواترین؛ دوا؛ قرە؛ هەرە دوایی؛ دوایەك؛ دوایین *(the ~ place; the ~ person)*.
(٢) دوا؛ تەنها ئەوەی کە ماوە.
(٣) ڕابوردوو (مانگ، ساڵ، هەفتە): *(~ month, week, year, etc.)*.
(٤) ئەوەی کە هەر چاوەڕوانی لێ ناکرێ؛ دوایین:
*(She was the ~ person that they would have suspected.)*
(٥) هەرە؛ گەورەترین *(of the ~ importance)*.
(٦) بێ نرخ ترین؛ دوا؛ کەمترین.
(٧) تازەترین؛ نوێ ترین.
(٨) دوا؛ تازەترین: *(the ~ word in scientific research)*.

*adv.* (١) لە دو ییدا؛ هەرە دوایی؛ دوا (٢) دواجار.
(٣) لە کۆتاییدا؛ لە ئاکامدا

*n.* (١) دوا شت: *(This is the ~ of the apples.)*.
(٢) دوا چەرخ، قۆناغ.

**at (long) last,** لە ئەنجامدا؛ لە ئاکامدا؛ لە هەرە دواییدا

**breathe one's last,** مردن؛ دوا هەناسە هەڵکێشان

**see the last of,** دوا چاوپێکەوتن؛ ئیتر نەبینینەوە
*(I hope we have seen the last of him.)*

**to the last,** هەتا مردن؛ هەتا دوا هەناسە.

**last** (last, läst), *v.i.* (١) بەردەوام بوون؛ خایاندن:
*(The war ~ed four years.)*
(٢) بەرگەگرتن؛ دەربردن؛ هەڵ کردن؛ مانەوە:
*(He will not ~ too long in his new job.)*
(٣) بەش کردن؛ مان؛ بەس بوون: *(will our food ~ ?)*.

**last** (last, läst), *n.* قالبی پێڵاو

*v.t.* قالب خستنەناو پێڵاوەوە.

**last** (last, läst), *n.* کێشانەیەکە بریتییە لە چوار هەزار پاوەند

**lasting** (las′tiŋ, läs′tiŋ), *adj.* هەمیشە؛ بەردەوام؛ بەرگەگر
*(a ~ peace)*

*n.* (١) هەمیشەیی؛ بەردەوامی؛ بەرگەگرتن (٢) جۆرە قوماشێکی قایمە.

**Last Judgment,** ڕۆژی قیامەت.

**lastly** (last′li, läst′li), *adv.* لە کۆتاییدا؛ لە ئەنجامدا؛ ئیتر:
*(I ~, I must explain that... )*

**Last Supper,** دوا شێوی عیسا پێش لە سێدارەدانی.
(هەروەها پێشی دەووترێت: **Lord's Supper**).

**last word,** (١) دوا گوفتار؛ دوا ووتە (کە گفتوگۆیەك یا مشتومڕێك دەبڕێنێتەوە). (٢) [Colloq.]، دوا مۆدە.

**latch** (lach), *n.* ئەڵقەڕێز؛ سوورگی؛ کلۆم.

*v.t. & v.i.* ئەڵقەڕێزکردن.

**latch on to, [Slang],** (١) خۆ پێوە هەڵواسین؛ دەست پێوە گرتن و بەرنەدان. (٢) دەسکەوتن؛ پەیداکردن. (٣) تێگەیشتن.

**latchet** (lach′it), *n.* قەیتانی پێڵاو.

**late** (lāt), *adj.* (١) درەنگ؛ دواکەوتوو؛ لە دوا.
(٢) (أ) دوا دوا؛ درەنگ؛ نزیکی کۆتایی: *(~ afternoon)*.
(ب) دوا؛ بەشی دوایی: *(the ~ Middle Ages)*.
(٣) خوالێخۆشبوو: *(the ~ president)*.

*adv.* (١) درەنگ؛ دواکەوتوو. (٢) لە دوا دوای.
(٣) تازە؛ بەم زووانە؛ لەم درەنگانەدا: *(I saw him as ~ as yesterday.)*.

**of late,** بەم زووانە؛ تازە؛ لەم دوایییەدا:
*(I have not seen him of late.)*

**too late,** کار لە کار ترازاوە؛ تازە درەنگە.

**lately** (lāt′li), *adv.* لەم دوایییەدا؛ لەم چەندانەدا؛ بەم زووانە:
*(I haven't seen him ~.)*

**latency** (lā′t'n-si), *n.* (١) شاراوەیی؛ نادیاری؛ داپۆشراوی.
(٢) ماتی؛ کش و ماتی (زیندەوەرزانی)؛ کپی؛ کپ بوون.

**latent** (lā′t'nt), *adj.* (١) شاراوە؛ نادیار؛ داپۆشراو:
*(~ talent, qualities, etc.)*
(٢) مات (زیندەوەرزانی)؛ کش و مات؛ خامۆش: *(~ disease germs)*

**latent period,** ماوەی نێوان تووش بوونی نەخۆشییەك و دەرکەوتنی نیشانەکانی.

**later** (lāt′ēr), *adv.* لە دواییدا؛ لە پاشدا؛ دوای ئەوە.

**later on,** لە دوای ئەوە؛ لە پاشا؛ دوایی.

**sooner or later,** ئێستا بێ یا کاتێکی تر؛ زوو بێ یا درەنگ:
*(We must all die sooner or later.)*

**lateral** (lat′ēr-əl), *adj.* لابەلایی؛ لەلاوە؛ لا؛ تەنیشت.
*(~ movement)*

*n.* شتی لابەلا؛ شتی تەنیشتی.

-lateraly *(adv.)*.

**latest** (lāt′ist), *adj.* تازەترین؛ نوێ ترین؛ دواترین؛ دوا.

**at the latest,** دوا کات؛ لەوە درەنگتر نا:
*(I will be back tomorrow at the latest.)*

**the latest,** تازەترین؛ نوێ ترین؛ دواهەمین.

**lath** (lath, läth), *n.* (١) تەختەداری باریك و تەنك (کە لە خانووسازی و تەیمانەی پەنجەرە و دەرگادا بەکاردەهێنرێت) (٢) پەڕە کانزای تەنکی کون کون یا تەلی هێڵەکی (خانووسازی).

*v.t.* تەختەداری باریك و تەنك لێدان؛ تەیمانە دروستکردن بە تەختەداری باریك و تەنك.

**lathe** (lāth), *n.* (١) ئامێری دار و کانزا داتاشین و ڕێك و پێك کردن.
(٢) چەرخی گۆزەکەر.

*v.t.* داتاشین و ڕێك و پێك کردنی تەختەدار و کانزا.

**lather** (lath′ēr), *n.* (١) کەفە سابوون؛ کەف.
(٢) کەفی لالفاوە و شوێنی تری لەش.

*v.t.* (١) کەفە سابوون لێدان؛ سابوون لێدان.
(٢) [Colloq.]، دارکاری کردن؛ فەلاقەکردن.

*v.i.* کەف کردن: *(This soap ~s well.)*.

**lathing** (lath′iŋ, läth′iŋ), ***n.*** تەختەداری باریك و تەنك لە دیوارو بنمیچ دان و گەچكاری كردنی.

**Latin** (lat′'n), ***adj.*** لاتینی (زمان، كلتوور، گەل، ئاینی كاسۆلیكی).

***n.*** (١) لاتینی: هاونیشتمانییەكی ڕۆمای كۆن.

(٢) لاتینی: زمانی لاتینی.

(٣) كەسێكی ئیتاڵی، ئیسپانی، یا ئەمەریكای لاتینی (كە زمانەكەیان لە لاتینییەوە وەرگیراوە) (٤) كاسۆلیكی؛ كاسۆلیكی پەروەر.

**Latinate** (lat′'n-āt′), ***adj.*** لە زمانی لاتینییەوە وەرگیراوە؛ پڕ لە وشەی لاتینی و لە لاتینییەوە وەرگیراو.

**Latinize** (lat′'n-īz′), ***v.t.*** (١) وەرگێران بۆ لاتینی؛ كردن بە لاتینی.

(٢) وەك لاتینی لێكردن (٣) بە تیپی لاتینی نووسین.

(٤) پەیڕەوی ئاین و دەستووری كاسۆلیكی كردن.

***v.i.*** ووتە و وشەی لاتینی بەكارهێنان.

**latish** (lāt′ish), ***adj.*** ئەختێ درەنگ

**latitude** (lat′ə-to͞od′, lat′ə-tūd′), ***n.*** (١) پانی؛ فراوانی

(٢) مەودا (٣) سەربەستی كردارو ڕادەربڕین و هەڵسان و دانیشتن؛ كردنی شت بە دڵی خۆ: ***. ( to allow people great ~ in their jobs.)***

(٤) هێڵی پانی (جوگرافیا).

(٥) (*pl.*) ناوچە ***( high ~s; low ~s)*** .

**-latitudinal** ***(adj.).***

**latitudinarian** (lat′ə-to͞o′d'n-âr′i-ən, lat′ə-tū′d'n-âr′i-ən), ***adj.*** مێشك كراوە (بەتایبەتی لە كاروباری ئاینیدا)؛ چاوپۆشیكەر.

***n.*** كەسێكی مێشك كراوە؛ كەسێكی چاوپۆشیكەر (بەتایبەتی لە سەربەستی ئاینیدا).

**-latitudinarianism** ***(n.).***

**latrine** (lə-trēn′), ***n.*** ئاودەستخانە (بەتایبەتی هی جەماوەری وەك لە ئۆردوگا و قوتابخانەدا)؛ پێشاو.

**-latry** (lə-tri), پاشگرێكە بەمانای: پەرستن: ***( idolatry)*** .

**latten** (lat′'n), ***n.*** (١) پەڕەی تەنكی مس.

(٢) پەڕەی تەنكی كانزا بەتایبەتی تەنەكە.

**latter** (lat′ẽr), ***adj.*** (١) دواتر؛ ئەوەی دوایی؛ بەشی دوایی؛ دواییەكەی:

***( the ~ part of the year, the century, the book, etc.)***

(٢) دووهەمین شت یا كەسی ناوبراو:

***( Of these two men the former is dead and the ~ still alive.)***

**-latterly** ***(adv.).***

**latter-day** (lat′ẽr-dā′), ***adj.*** تازەباو؛ نوێ باو

**lattermost** (lat′ẽr-mōst′), ***adj.*** دواترین.

**lattice** (lat′is), ***n.*** (١) تەیمانەی پەنجەرە و دەرگا؛ تەلی پەنجەرە و دەرگا.

(٢) چوارچێوەی تەنراو (٣) دەرگا و پەنجەرەی تەیمانەدار.

***v.t.*** (١) تەیمانە دروستكردن؛ وەك تەیمانە لێكردن

(٢) تەیمانە لێدان؛ بە تەیمانە داپۆشین.

**lattice work** (lat′is-wûrk′), ***n.*** تەیمانەی دەرگا و پەنجەرە؛ چوارچێوەی تەیمانەیی.

**laud** (lôd), ***n.*** (١) ستایش؛ پیاهەڵدان

(٢) سروود یا گۆرانی ستایشی

***v.t.*** ستایش كردن؛ بە شان و باهودا هاتنە خوارەوە.

**laudable** (lôd′ə-b'l), ***adj.*** جێی ستایشە؛ باش.

**laudanum** (lôd′'n-əm, lôd′nəm), ***n.*** (١) شتێكی گیراوەیە بە تلیاكەوە (٢) گیراوەیەكی تلیاك و خواردنەوەی كحولییە.

**laudation** (lô-dā′shən), ***n.*** ستایش كردن؛ ستایشكاری؛ ستایش.

**laudative** (lôd′ə-tiv), ***adj.*** = **laudatory.**

**laudatory** (lôd′ə-tôr′i, lôd′ə-tō′ri), ***adj.*** ستایشكار؛ ستایشكەر

**laugh** (laf, läf), ***v.i.*** پێكەنین

***v.t.*** (١) بە پێكەنین دەربڕین. (٢) بە پێكەنین وەدیهێنان یا والێكردن.

***n.*** (١) پێكەنین. (٢) شتێك كە مایەی پێكەنین بێت

**have the last laugh,** لە ئەنجامدا بردنەوە یا سەركەوتن پاش ژێركەوتنێكی سەردەمی

**laugh at,** پێ پێكەنین؛ گاڵتەپێكردن

**laugh away,** خۆ دەربازكردن یا پەڕاندنەوە لە شتێكی ناخۆش بە پێكەنین؛ بە پێكەنین بردنە سەر:

***( to laugh away a person's fears or doubts)***

**laugh in one's sleeve,** بە دزییەوە پێكەنین؛ لە ناوەوە پێكەنین.

**laugh off,** خۆ پەڕاندنەوە لە بارێكی ناخۆش بە پێكەنین، لاقرتێ، یا بێباكی نواندن: ***( to laugh off an embarrassing situation)***

**laugh out of ( or on ) the other ( or wrong ) side of the-mouth,** هەست بە ناخۆشی كردن پاش خۆشی.

**no laughing matter,** (شتێكی) گاڵتە نییە؛ شتێكی گرنگە و نابێ بە سووكی بگیرێ؛ گاڵتەی پێ ناكرێ.

**laughable** (laf′əb'l, läf′ə-b'l), ***adj.*** سەیر؛ شایانی گاڵتە یا پێكەنینە؛ بۆ پێكەنین یا گاڵتەپێكردن باشە.

**-laughableness** ***(n.)***; **laughably** ***(adv.).***

**laughing gas,** گازی پێكەنین.

**laughing jackass,** = **kookaburra.**

**laughingly** (laf′iŋ-li, läf′iŋ-li), ***adv.*** بە پێكەنینەوە؛ بە گاڵتەوە.

**laughing-stock** (laf′iŋ-stok′, läf′iŋ-stok′), ***n.*** قەشمەری؛ كەسێك یا شتێك كە گاڵتەجی هەمووكەس بێت.

**laughter** (laf′tẽr, läf′tẽr), ***n.*** پێكەنین.

**launch** (lônch, länch), ***v.t.*** (١) تەقاندن؛ هەڵدان؛ فڕێدان؛ ناردن (بۆ ئاسمان وەك مووشەك یا كەشتی ئاسمانی):

***( to ~ a missile, rocket, etc.)***

(٢) بۆ یەكەم جار خستنەناو ئاوەوە و خستنەگەڕ (كەشتی و بەلەمی تازە)

(٣) هێرش بردنە سەر؛ دەست بە هێرش كردن: ***( to ~ an attack)*** .

(٤) دامەزراندن (لەسەر كار یا پیشەیەك)؛ دەستپێكردن.

***( to ~ a new career; to ~ a young man into business)***

***v.i.*** (١) ناردنە ناو دەریاوە؛ دەستپێكردن.

(٢) ( **~ into** ) خۆ تێ فڕێدان؛ بە جۆشەوە دەستپێكردن:

***( She ~ed into a tirade.)***

***n.*** (١) نزم كردنەوەی كەشتی یا بەلەمێكی تازە بۆ ناو دەریا.

(٢) حەوزی كەشتی دروستكردن (كە كەشتی تازەی لێوە دەنێررێتە ناو دەریا).

(٣) كاتی دەستپێكردن (كار، هێرش، مووشەك تەقاندن).

**launch** (lônch, länch), ***n.*** (١) گەورەترین بەلەمی سەر كەشتییەكی جەنگی. (٢) بەلەمی مەكینە.

**launching pad, launch pad ( or platform ),** بنكەی مووشەك تەقاندن؛ بنكەی هاویشتن یا تەقاندنی مووشەك و كەشتی ئاسمانی

**launder** (lôn′dẽr, län′dẽr), ***n.*** تەشتی پاككردنەوە كانزای خاو.

***v.t.*** جل شتن؛ جل شۆردن: ***( to ~ clothes)*** .

***v.i.*** (١) بەرگەی شتن گرتن: ***( This fabric ~s well.)*** .

(٢) جل شتن؛ جل شۆردن

**laundress** (lôn′dris, län′dris), ***n.*** جل شۆر (ئافرەت)

**laundromat** (lôn′drə-mat′, län′drə-mat′), ***n.*** جل شۆرك؛ جل شۆرخانە.

**laundry** (lôn′dri, län′dri), ***n.*** (١) جل شتن؛ جل شۆردن.

(٢) جل شۆرك؛ جل شۆرخانە

(٣) (ا) جلی پیس (كە دەبێت بشۆرێ یا ئامادەیە بۆ شتن):

***( I have to do my ~ today.)***

(ب) جلی تازە شۆراو

**laundryman** (lôn′dri-mən, län′dri-mən), ***n.*** كرێكار یا سەرپەرشتیكەری جل شۆرخانە و ئوتوخانە.

**laundrywoman** (lôn′dri-woom′ən, län′dri-woom′ən), *n.* = laundress.
**laureate** (lô′ri-it), *adj.* (١) بە چڵ و گوڵ و گەڵای " دەفنە " چنراو
(٢) گوڵبەندی "دەفنە" پێ بەخشراو.
(٣) هەڵکەوتوو (بەتایبەتی هۆنەر)؛ شاعیری بلیمەت.
(٤) خەڵات کراو ( *Nobel* ~ )
*n.* (١) کەسێکی گوڵبەندی " دەفنە " پێ بەخشراو؛ کەسێکی خەڵات کراو.
(٢) هۆنەری هەڵکەوتوو؛ شاعیری کۆشکی پادشا
*v.t.* (١) ڕێزلێنان بە گوڵبەندی " دەفنە " پێ بەخشین.
(٢) کردن بە هۆنەری کۆشکی پادشا.
-laureateship *(n.)*.
**laurel** (lô′rəl, lär′əl), *n.* (١) دەفنە: درەختێکی هەمیشە سەوزە
(٢) گوڵبەندی ئەم درەختە کە بە کەسێك دەبەخشرێت لە سەرکەوتنیدا؛
گوڵبەندی سەرکەوتن. (٣) (*pl.*) (ا) پلەوپایە بەرزی؛ ناوداری؛ ناوبانگ.
(ب) سەرکەوتن.
*v.t.* (١) گوڵبەندی سەرکەوتن پێ بەخشین (٢) ڕێزلێنان
**look to one's laurels,** پاراستنی دەسکەوت و پلەوپایەی خۆ لە هاوچاوان
**reap ( or win ) one's laurels,** ڕێز لێ نران؛ گوڵبەندی سەرکەوتن پێ بەخشران؛ بەروبوومی سەرکەوتن خواردن.
**rest on one's laureels,** شانازی کردن بە سەرکەوتنی ڕابوردووەوە و پاڵ لێدانەوە؛ ڕازی بوون بە دەسکەوت و سەرکەوتنی ڕابوردوو قاچ لێ ڕاکێشان.
**lava** (lä′və, lav′ə), *n.* (١) ئاگراو؛ شلەی ئاگرینی ئاگرپژێن
(کە بریتییە لە کانزاو بەردی تواوە). (٢) ئەم ئاگراوە پاش ساردبوونەوەی و وەك بەردلێهاتنی
**lavatory** (lav′ə-tôr′i, lav′ə-tō′ri), *n.* (١) جورنە؛ دەستشۆر.
(٢) ئاودەستخانە؛ ئاودەست؛ پێشاو؛ ژووری دەست شتن.
**lave** (lāv), *v.t. & v.i.* شتن؛ شۆردن
**lave** (lāv), *v.t.* بە چەمچە تێکردن یا هەڵهێنجان.
**lavender** (lav′ən-dẽr), *n.* (١) گوڵە خەرێم؛ چاران چەقیلە؛
ڕووەکێکی بۆن خۆشە. (٢) بۆن و گوڵاوی ئەم گوڵە (٣) ئەرخەوانی
*adj.* ئەرخەوانی
*v.t.* بۆن خۆش کردن بەم گوڵە.
**laver** (lā′vẽr), *n.* (١) جورنە (بەتایبەتی هی مس کە لە کەنیشتەدا دەست و قاچی تێدا دەشۆرا). (٢) پاکژکەرەوە؛ شتی پاککەرەوەی گیانی.
**laver** (lā′vẽr), *n.* جۆرە گیایەکی دەریاییە دەخورێت.
**lavish** (lav′ish), *adj.* (١) دەستبڵاو؛ بدە؛ دەست و دڵ تێر:
*( to be ~ in giving one's money)*
(٢) (ا) زیاد لە پێویست؛ زۆر؛ فەنتازی؛ فرە؛ بەرچاوتێر:
*( ~ praise; ~ expenditure; a ~ party, life-style, etc.)*
*v.t.* بە دەست و دڵ تێرانە پێدان یا خەرج کردن
*( He ~ed his love on his children.)*
-lavishly *(adv.)*; lavishness *(n.)*.
**law** (lô), *n.* (١) قانون؛ یاسا؛ دەستوور. (٢) قانونێك؛ یاسایەك
(٣) ئاسایش؛ ئاسوودەیی: *( They have established ~ and order.)* .
(٤) زانستی یاسا؛ یاساگەری.
(٥) دادگا *( They had to resort to ~ to settle the matter.)* .
(٦) یاسای تایبەتی بە بەشێکی تایبەتی ژیان: *( business ~ )*
(٧) دادگەری؛ دادپرسی؛ پارێزەری؛ پیشەی دادپرس و پارێزەر.
(٨) یاسا زانین (٩) پەیڕەو؛ یاسا.
(١٠) هەست و هۆشی زگماکی *( the ~ of self-preservation)* .
(١١) فەرمانی خودایی.
**go to law,** چوونە دادگا بۆ دادپرسی؛ شکات کردن
**lay down the law,** زەبروزەنگ نواندن؛ سنوور بۆ دانان؛ بەر بۆ بەرەڵا نەکردن
**take the law into one's own hands,** مافی خۆ سەندن بە دەستی خۆ و بەزۆر (لەباتی چوونە دادگا).
**law-abiding** (lô′ə-bīd′iŋ), *adj.* یاساپەرست؛ یاساپەروەر؛ ملکەچ.
**law-breaker** (lô′brāk′ẽr), *n.* یاساشکێن.
**law-breaking** (lô′brāk′iŋ), *n.* یاسا شکاندن.
*adj.* یاساشکێن
**law court,** دادگا.
**lawful** (lô′f'l), *adj.* (١) یاسایی؛ بەپێی یاسایە؛ ناقەدەغە:
*( a ~ act; ~ methods)*
(٢) دان پێدانراو؛ دەستووری *( the ~ heir)* .
(٣) درووست؛ حەڵاڵ: *( a ~ marriage)* .
-lawfully *(adv.)*; lawfulness *(n.)*.
**lawgiver** (lô′giv′ẽr), *n.* (١) یاسای گەل بدەر؛ پێشەوایەکە کە دەستووری ژیان دادەنێت بۆ گەلەکەی. (٢) **lawmaker** .
**lawless** (lô′lis), *adj.* (١) بێ یاسا؛ بەرەڵا: *( a ~ city)* .
(٢) قەدەغە؛ دژ بە یاسا: *( a ~ act)* .
(٣) لاسار؛ یاخی؛ سەرکێش: *( a ~ person)* .
-lawlessly *(adv.)*; lawlessness *(n.)*.
**lawmaker** (lô′māk′ẽr), *n.* یاسادانەر
**lawn** (lôn), *n.* چیمەن.
**lawn** (lôn), *n.* مەلمەل؛ کرێشە.
**lawn mower,** چیمەنبڕ؛ مەکینەی چیمەن بڕین.
**Law of Moses,** یاسای موسا؛ تەورات.
**law of nations,** یاسای نێو وڵاتان.
**lawsuit** (lô′sōōt′, lô′sūt′), *n.* دادخوازی؛ داواکاری (دادگا).
**lawyer** (lô′yẽr), *n.* پارێزەر (دادگا).
**lax** (laks), *adj.* (١) ڕەوان؛ سکچوو
(٢) شل؛ شل و شێواو؛ خاو.
(٣) (ا) کەمتەرخەم؛ بێباك: *( to be ~ about paying one's bills)* .
(ب) بەرەڵا (ڕەووشت)؛ شل (مەجان)؛ سووك (مەجان): *( ~ morals)* .
(٤) خاو یا کشاو (زمان و کاژێر لەکاتی بێژانی هەندێ لە دەنگە بزوێنەکاندا وەك: " e " لە let وە " i " لە hide دا).
-laxity *(n.)*; laxness *(n.)*.
**laxative** (lak′sə-tiv), *adj.* سك ڕەوێن.
*n.* دەرمانی ڕەوانی؛ ڕەوانکەرە.
**lay** (lā), *v.t.* (١) بە زەویدا دان؛ خستنە خوارەوە:
*( He laid his opponent low with one punch.)*
(٢) ( **~ in; ~ on** )، دانان؛ دانان لەسەر، لەژێر، یا لەناو؛ خستنەسەر؛ پاڵخستن: *( L~ the pencil on the table.)*
(٣) دانان لە شوێنێکی تایبەتیدا؛ خستنە شوێنێکی تایبەتی؛ خشتکاری کردن: *( to ~ bricks, a carpet, etc.)* .
(٤) خستنەسەر؛ پێدان: *( He ~s great emphasis on occuracy.)*
(٥) هێلکەکردن: *( Chickens ~ eggs.)* .
(٦) هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە: *( His doubts were laid.)*
(٧) پارەدانان بۆ گرەو.
(٨) لەسەر دانان (باج، سزا)؛ بۆ بڕینەوە.
(٩) دانان (نەخشە، پیلان)؛ کردن: *( L~ your plans carefully.)*
(١٠) ئامادەکردن (مێزی نان خواردن).
(١١) بە هی خۆ دانان؛ دەست بەسەردا گرتن:
*( He laid claim to the property.)*
(١٢) خستنەپاڵ؛ دانەپاڵ: *( The murder was laid to Jones.)*
(١٣) [Slang]، گاین؛ جووت بوون لەگەڵ.
*v.i.* (١) هێلکەکردن. (٢) گرەوکردن.
(٣) ڕاکشان؛ پاڵکەوتن. (٤) بە چالاکی کارکردن.

***n.*** (١) بار: جۆنێتی هاتنه بەرچاوی شوێنێك؛ چۆنێتی ڕێكخرانی زەوی‌وزار:
***(the ~ of the land)***
(٢) بەش (لە قازانجێك).
(٣) پلەی لوول خواردنی تاڵی گوریس یا پەت
(٤) [Slang]، (ا) هاوسەر: ئافرەتێك (كە لەگەڵی جووت دەبێت):
***(a good ~)***
(ب) گان
**lay about (one),** (١) ئازایانە جەنگان؛ بە هەموو لایەكدا لێدان؛ مستەكوڵە كێشان بە هەموو لایەكدا.
(٢) چالاكی نواندن.
**lay a course,** (١) بە لایەكی تایبەتیدا ڕۆیشتن (كەشتی).
(٢) نەخشەدانان؛ ڕێ دانان بۆ كارێك.
**lay aside,** (١) خستنەلاوە؛ لابردن؛ لادان:
***(He laid his book aside to listen.)***
(٢) هەڵگرتن؛ پاشەكەوت كردن؛ خستنەلاوە:
***(to lay aside money for one's old age)***
(٣) وازهێنان (خوو)؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ تەرك كردن.
**lay away,** (١) پاشەكەوت كردن؛ هەڵگرتن؛ خستنەلاوە.
(٢) خستنە لاوە (فرۆتەنی لە فرۆشگایەكدا پاش ئەوەی كڕیارەكە پێشەكی هەندێ لە نرخەكەی دەدات)؛ بۆ دانان (فرۆتەنی):
***(I asked the store manager to lay away a suitcase for me.; Some stores lay away merchandise for their clients after they pay a percentage of the price.)***
(٣) ناشتن
**lay bare,** ڕووتكردن؛ ڕووتكردنەوە؛ خستنەڕوو
**lay before,** خستنە بەرچاو؛ خستنە بەردەم؛ خستنە پێش؛ پێشكەش كردن: ***(to lay the facts before them).***
**lay by,** هەڵگرتن؛ پاشەكەوت كردن.
**lay down,** (١) خۆبەختكردن؛ ژیانی خۆ بەختكردن:
***(to lay down one's life for a cause or a person)***
(٢) پێ دان بە زەویدا؛ لەسەر سووربوون؛ زەبر نواندن؛ ووتن بە توندی:
***(to lay down the law)***
(٣) چەك فڕێدان؛ خۆ دان بە دەستەوە: ***(to lay down one's arms).***
(٤) گرەوكردن. (٥) عەماركردن؛ هەڵگرتن.
**lay (fast) by the heels,** بەندكردن؛ گرتن؛ پێوەندكردن؛ ڕێی دەربازبوون لێ گرتن.
**lay for, [Colloq.],** خۆ بۆ مات دان (بۆ پەلاماردان)
**lay hands on,** (١) لێدان (زللە، مستەكوڵە):
***(Don't lay hands on the child.)***
(٢) دۆزینەوە.
**lay into, [Slang],** (١) لێدان یا پیامالین پەیتا پەیتا.
(٢) سەرزەنشتكردن؛ هێرش بردنە سەر بە دەم.
**lay it on, [Colloq.],** (١) فشەكردن. (٢) بە شان و باڵدا هاتنە خوارەوە.
**lay low,** (١) بە لەپەوە كەوتن.
(٢) [Slang]، سەری خۆ كزكردن؛ خۆشاردنەوە.
**lay off,** (١) خستنەلاوە (مشتومڕ).
(٢) لە كار دەركردن (بەتایبەتی بۆ ماوەیەكی كورت)؛ لێ خستن:
***(He was laid off yesterday.)***
(٣) سنوور بۆ دانان؛ سنوور جیاكردنەوە.
(٤) [Slang]، (ا) وەستان؛ وازهێنان
(ب) لە گاڵتەپێكردن یا سەر خستنەسەر وەستان؛ بڕینەوە (قسەی ناشرین، سەر خستنەسەر، ڕەخنە... هتد).
**lay on,** (١) لێ هەڵسوون؛ لێدان (مەڵحەم، ڕۆن... هتد).
(٢) هێرش بردنە سەر؛ لێدان بە توند.
**lay oneself open,** خۆ خستنە بەر یا ڕێ دان بە (هێرش، لۆمە، ڕەخنە):
***(to lay oneself open to criticism by one's actions)***
**lay open,** (١) هەڵدڕین؛ كردنەوە. (٢) خستنەڕوو؛ هەڵماڵین.
**lay out,** (١) خەرج كردن. (٢) ڕێك‌وپێك كردن؛ ڕیزكردن.
(٣) ڕاخستن؛ داخستن؛ هێنانەڕوو.
(٤) شۆردن‌و كفن كردن؛ ئامادەكردن بۆ ناشتن.
(٥) [Slang]، بە زەویدا دان‌و لە هۆش خۆ خستن؛ كوشتن.
**lay over,** لادان (ڕێبوار)؛ مانەوە یا پشوودانی ڕێبوار لەنێوان دوو قۆناغدا
**lay to rest,** ناشتن؛ بە خاك سپاردن.
**lay up,** (١) هەڵگرتن؛ پاشەكەوت كردن؛ خستنەلاوە.
(٢) پەككەوتن (نەخۆش). (٣) لە كار كێشانەوە بۆ چاك كردن (كەشتی)
**lay waste,** وێران كردن.

**lay** (lā), *past tense of* **lie,** ڕاكشان.

**lay** (lā), ***adj.*** (١) تایبەتی بەوانەی كە قەشە نین.
(٢) تایبەتی بە بۆرەپیاو یا بۆرەپیاوان؛ تایبەتی بە كەسێك كە ئەوە پیشەی نەبێت كە باسی دەكرێت:
***(No ~ reader will understand this medical text.)***

**lay** (la), ***n.*** (١) هەڵبەستێكی كورت (بەتایبەتی كە بكرێت بە گۆرانی).
(٢) [Archaic]، گۆرانی؛ ئاواز.

**layer** (lā'ẽr), ***n.*** (١) چین؛ توێخ؛ توێك؛ لۆ؛ توێ؛ تیرە؛ توێژ:
***(a ~ of meat, clay, etc.)***
(٢) (ا) وەستا (خشتكاری)؛ خشتكاریكەر: ***(a brick- ~ ).***
(ب) هێلكەكەر: ***(good ~s; bad ~s).***
(٣) چڵێكە دەكرێت بەژێر خاكەوەو ڕەگ دادەكوتێ بەبێ ئەوەی لە ڕووەكەوە بكرێتەوە.
***v.t. & v.i.*** ڕوواندنی ڕووەك بە كردنی چڵەكانی بەژێر خاكەوە بۆ ڕەگ داكوتان بەبێ لێكردنەوەیان لە ڕووەكە.

**layer cake,** كێكی چین چین.

**layman** (lā'mən), ***n.*** (١) كەسێك كە قەشە نەبێت.
(٢) مرۆڤی ڕەمەكی؛ بۆرەپیاو؛ كەسێك كە ئەوە پیشەی نەبێت كە باسی دەكرێت: ***(This medical textbook is not for the ~.).***

**layoff** (lā'ôf'), ***n.*** (١) لە كار دەركردن بۆ ماوەیەك؛ لێ خستنی سەردەمی:
***(There were many ~s in the oil industry last year.)***
(٢) ماوەی ئەم لێ خستنە.

**lay-out** (lā'out'), ***n.*** (١) ڕاخستن؛ بڵاوكردنەوە؛ خستنە بەرچاو
(٢) نەخشە: ***(the ~ of a factory).***
(٣) شێوەی ڕێكخستن: ***(The newspaper ~ is his responsibility.).***
(٤) [Colloq.]، بارەگا؛ فەرمانگە؛ جێی كاری كەشخە.
(٥) كۆمەڵە ئامێر.

**lay-over** (lā'ō'vẽr), ***n.*** لادان (ڕێبوار)؛ پشوودان یا مانەوەی ڕێبوار لەنێوان دوو قۆناغدا.

**lazar** (lā'zẽr, laz'ẽr), ***n.*** سواڵكەرێكی گەر.

**lazaretto** (laz'ə-ret'ō), ***n. Also*** **lazaret, lazarette,** (١)- خەستەخانەی گەران؛ خەستەخانەی نەخۆشییە درمەكان.
(٢) كەرەنتینەخانە. (٣) گەنجینەی كەشتی.

**laze** (lāz), ***v.i.*** تەمەڵی كردن؛ سووڕانەوە
***v.t.*** ( ~ away), كات كوشتن؛ تەمەڵی كردن؛ سووڕانەوە.

**laziness** (lā'zi-nis), ***n.*** تەمەڵی؛ تەمەڵێتی.

**lazuli** = **lapis lazuli.**

**lazy** (lā'zi), ***adj.*** (١) تەمەڵ؛ لەش گران
(٢) سست‌و قورس؛ خاو؛ خاووخلیچك: ***(a ~ motion).***
(٣) كاتی پشت لێكردنەوە یا پشوودان: ***(a ~ day)***
-lazily *(adv.).*

**lazy-bones** (lā'zi-bōnz'), ***n.*** [Colloq.]. كەسێكی تەمەڵ

**lazy tongs,** مقاشی تەمەڵگەل: مقاشێكە شتوومەكی پێ هەڵدەگیرێ‌و دەهێنرێ.

**lazzarone** (laz´ə-rō′nā), ***n.*** سوالکەری بێ لانە.

**lb.**, [L.], libra = pound.

**lea** (lē), ***n.*** [Poetic], مێرگ؛ لەوەڕگا

**leach** (lēch), ***v.t.*** (١) پالاوتن؛ پاککردنەوە.

(٢) لێ دەرهێنان (بە پالاوتن).

***v.i.*** (١) لێ دەرهێنران (بە پالاوتن یا شۆردنەوە). (٢) توانەوەو ئاوبردن.

***n.*** (١) پالاوتن (٢) ئامێرێکی وەك بێژنگە.

(٣) ماددەیەکە شلەیەکی پێ دەپالێورێ

**lead** (lēd), ***v.t.*** (١) پێشڕەوی کردن؛ سەرکردەیی کردن:

***( to ~ a people)***

(٢) ڕاکێشان (جلەو): ***( He led the horse by the bridle.)*** .

(٣) پێشکەوتن؛ ڕێ پیشاندان: ***( L~ the way!)*** .

(٤) والێکردن؛ بوون بە هۆ: ***( His troubles led him to drink.)*** .

(٥) چوون بۆ: ***( This room ~s to another one.)*** .

(٦) پێ کردن ***( A teacher ~s his pupils to think clearly.)*** .

(٧) سەرکردەیی یا سەرتیپی کردن (لقە لەشکر. هێرش: ئۆرکیسترا، باڵ).

(٨) بردنەسەر (ژیان)؛ ژین: ***( He ~s a busy life.)*** .

(٩) پێ بردنە سەر (ژیان): ***( She ~s him a dog's life.)*** .

(١٠) دەستپێکردن؛ کردنەوە

***v.i.*** (١) پێشڕەوی کردن؛ سەرکردەیی کردن؛ ڕێنومایی کردن.

(٢) وەها بوون؛ وەها ڕۆیشتن.

(٣) بوون بە هۆ ***( One thing led to another.)*** .

(٤) دەستپێکردن (٥) یەکەم مستەکۆڵە هاویشتن (بۆکسبازی).

(٦) یەکەم دەست یاری کردن (یاری کاغەز)

***n.*** (١) سەرکردەیی؛ پێشڕەوی:

***( In community projects he always took the ~ .)***

(٢) وێنە؛ نموونە ***( We will follow your ~ .)*** .

(٣) پێشکەوتن (پێشبڕکێ).

(٤) مەودای پێشکەوتن (پێشبڕکێ): ***( We hold a safe ~ .)*** .

(٥) نیشانە؛ کلیلی مەتەڵ هەڵهێنان.

(٦) یەکەم مستەکۆڵە (بۆکسبازی).

(٧) یەکەم دەست یا مافی یەکەم دەست یاری کردن (یاری کاغەز).

(٨) تەلی ئەلەکتریك گەیێن.

(٩) (ا) دەوری سەرەکی (فیلم، شانۆنامە): ***( Who plays the ~ ?)*** .

(ب) نواندەری سەرەکی کە ئەم دەورە دەبینێ.

(١٠) (ا) سەردێڕ یا یەکەم بەندی دەنگوباسێك (ڕۆژنامەگەری).

(ب) دەنگوباسی سەرەکی (ڕۆژنامەگەری، تەلەفزیۆن، ڕادیۆ):

***( the ~ story in today's papers)***

(١١) چینە کانزای خاوی زێڕاوی لە بنی ووشکە ڕوباردا.

***adj.*** پێشەوە؛ هی پێشەوە؛ یەکەم: ***( the ~ horse)*** .

**lead astray**, بەهەڵەدابردن؛ خستنەسەر ڕێی چەوت

***( He was led astray by evil companions.)***

**lead ( a person ) by the nose**, جلەوی کەسێك بە دەست بوون

***( She leads him by the nose.)***

**lead off**, دەستپێکردن؛ کردنەوە (ئاهەنگ، کۆڕ، ووتار... هتد):

***( Who is going to lead off the discussion?)***

**lead on**, (١) فریودان؛ هاندان؛ دان بۆ ڕۆکردن؛ تەفرەدان:

***( She led him on.; Don't lead people on.)***

(٢) بەرەو پێشەوە بردن؛ پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە.

**lead the way**, پێشکەوتن؛ ڕێ پیشاندان؛ ڕێنومایی کردن؛

بوون بە نموونە بۆ خەڵك.

**lead up to**, (١) ڕێ بۆ تەختکردن؛ بەرە بەرە بۆ ئامادەکردن؛

بەرەو مەبەست بردن (گفتوگۆ)

***( I don't know what you're leading up to.)***

(٢) بوون بە ئەنجام؛ بەرەو ئەوە ڕۆیشتن.

**lead** (led), ***n.*** (١) قوڕقوشم.

(٢) شتێکی قوڕقوشمی: (ا) سەنگێکە بۆ پێوانی قووڵایی دەریا.

(ب) (*pl.*)، [British]، پەڕەی قوڕقوشمییە بۆ سەربان داپۆشین.

(ج) چوارچێوەی شووشەی پەنجەرە.

(د) تیلماسکێکە بۆ جیاکردنەوەی دێڕی چاپەمەنی.

(٣) فیشەك؛ گوللە.

(٤) گرافیت: جۆرە کاربۆن (خەڵوون)ێکە قەڵەمی ڕەشی لێ دروستدەکرێت.

***adj.*** قوڕقوشمی.

***v.t.*** (١) قوڕقوشم لێدان. (٢) سوورکردنەوە بە قوڕقوشم (گلێنەکاری).

(٣) پان کردنی نێوان دێڕەکانی چاپەمەنی بە تیلماسکی قوڕقوشمی.

***v.i.*** قوڕقوشماوی بوون؛ قوڕقوشم لێدران.

**leaden** (led′'n), ***adj.*** (١) قوڕقوشمی. (٢) قورس؛ گران (سەنگ).

(٣) سست؛ خاو؛ قنگ گران. (٤) خەمبار؛ مات؛ دڵتەنگ.

(٥) خۆڵەمێشی؛ قوڕقوشمی (ڕەنگ).

**leader** (lēd′ēr), ***n.*** (١) سەرۆك؛ سەرکردە؛ ڕابەر؛ فەرماندەر؛ پێشڕەو؛

پێشەوا؛ سەرگەورە. (٢) بەڕێوەبەر.

(٣) (ا) سەرۆکی حیزب یا ڕێکخراوێك.

(ب) کەسێکی بەدەسەڵات لە کۆمەڵەیەکی ڕامیاریدا؛ سەرکردە.

(٤) (ا) سەردەستە (تیپی مۆسیقا).

(ب) مۆسیقاژەنی سەرەکی (تیپی مۆسیقا).

(٥) ئەسپی پێشەنگ (گالیسکەی چەند ئەسپی).

(٦) سەروووتار (ڕۆژنامەگەری).

(٧) (*pl.*) ڕیزە خاڵی چاو ئاراستەکەر بۆ ئەوپەڕی لاپەڕە (وەك لە پێرستدا).

(٨) بۆری (بۆ ئاوەڕۆی سەربان).

(٩) ژێ (تونکاری)؛ ماسولکەژێ.

(١٠) ژێیەکی کورتە قولاپ یا دانی پێوە دەبەسترێت بە ژێ سەرەکییەکەوە (ڕاوەماسی).

(١١) تەوقەسەری چڵە دار یا دەوەن؛ چڵ یا لقی سەرەکی ڕووەك.

**leadership** (lēd′ēr-ship´), ***n.*** (١) سەرکردایەتی؛ سەرۆکایەتی؛

ڕابەرایەتی؛ پێشڕەوی؛ پلەوپایەی سەرکردە.

(٢) توانای سەرکردایەتی یا سەرۆکی.

(٣) کۆمەڵە سەرکردە؛ دەستەیەك سەرۆك.

**lead-in** (lēd′in´), ***n.*** (١) پێشەکی؛ سەرەتا.

(٢) بەرنامەی پێشەنگ (تەلەفزیۆن، ڕادیۆ).

(٣) تەلی پێ گەیێن: ئەو بەشەیە لە تەلی ئێریەلێك کە دەبەسترێت بە ئامێرە ئەلەکترۆنییەکەوە وەك تەلەفزیۆن و ڕادیۆ.

**leading** (lēd′iŋ), ***n.*** سەرۆکایەتی کردن؛ سەرکردایەتی کردن؛

پێشڕەوێتی؛ ڕابەرێتی.

***adj.*** (١) سەرەکی؛ گرنگ؛ بنچینەیی: ***( a ~ writer, factor, role)*** .

(٢) لەپێش هەموانەوە؛ یەکەم؛ پێشەنگ: ***( the ~ candidate)*** .

(٣) نوانەری سەرەکی؛ دەوری سەرەکی بینین (فیلم، شانۆنامە):

***( a ~ lady, man)***

**leading article**, سەروووتار (ڕۆژنامەگەری).

**leading lady**, نوانەری سەرەکی (فیلم، شانۆنامە).

**leading man**, نوانەری سەرەکی (فیلم، شانۆنامە).

**leading question**, پرسیارێکە وەها دەکرێت کە ئەو وەڵامەی

پرسیارکەرەکە دەیەوێت بیدرێتەوە.

**lead line**, = sounding line.

**lead-off** (lēd′ôf´), ***n.*** (١) سەرەتا (وەرزش)؛ یەکەم لێدان (یاری).

(٢) سەرەتا.

***adj.*** دەستپێکەر؛ تایبەتی بە دەستپێکردن.

**lead pencil**, قەڵەمی ڕەش؛ قەڵەم

**lead poisoning**, ژەهری قوڕقوشم لێدران (کە دەبێتە هۆی خوێن کەمی و قەبزی و سك ئێشە و ماسولکە ئێشە و گۆجی).

**leadsman** (ledz′mən), ***n.*** قووڵایی دەریا پێو.

**leady** (led′i), *adj.* (١) قورقوشمی؛ لە قورقوشم دەچێت. (٢) قورس

**leaf** (lēf), *n.* (١) گەڵا. (٢) (ا) پەڕەی گوڵ. (ب) پەڕە گەڵا.
(٣) پەڕە؛ پەڕە کاغەز.
(٤) (ا) پەڕەی خوان (کە دەتوانرێ لە مێزەکە بکرێتەوە یا بخرێتەوە سەری بەپێی کەم و زۆری میوان). (ب) پەڕەی چەسپیوی خوان.
(٥) پەڕەی دەرگاو پەنجەرەی نوشتاوە.
(٦) پەڕەی کانزایی.

*v.i.* (١) گەڵاکردن؛ گەڵاگرتن: *( Trees ~ in the spring.)* .
(٢) ( ~ through ): پەڕە هەڵدانەوە؛ پەڕەپەڕەکردن:
*( to ~ through a book)*

*v.t.* پەڕەپەڕەکردن؛ پەڕە هەڵدانەوە.

**in leaf,** گەڵاگرتوو؛ سەوز؛ گەڵای پێوەیە:
*( The fig tree is in leaf.)*

**take a leaf out of a person's book,** لەسەر ڕێ و شوێنی کەسێك ڕۆیشتن؛ کردنی کەسێك بە نموونەی خۆ.

**turn over a new leaf,** پەڕەیەکی تازە هەڵدانەوە لە ژیاندا (بەتایبەتی بەمانای تەرك کردنی خووی خراپ)؛ سەرلەنوێ دەستپێکردن و بیرچوونەوەی رابوردوو

**leafage** (lēf′ij), *n.* گەڵا؛ سەرجەمی گەڵاکانی ڕووەکێك یا درەختێك

**leaf hopper,** مێرووی بازدەر (شیلەو تەڕایی گەڵا دەخوات).

**leafless** (lēf′lis), *n.* بێ گەڵا؛ ڕووت

**leaflet** (lēf′lit), *n.* (١) گەڵاچکۆلە؛ گەڵای تازە.
(٢) بەشێکی گەڵایەکی خانە خانەدار. (٣) بڵاونامە (بەتایبەتی هی کورت و پروپاگەندە)؛ نامیلکە: *( propaganda ~s)*

**leaf-stalk** (lēf′stôk′), *n.* لاسکە گەڵا

**leafy** (lēf′i), *adj.* (١) گەڵادار؛ لە گەڵا پێکهاتوو؛ گەڵایی.
(٢) گەڵای زۆرە؛ پڕ گەڵا.
(٣) گەڵا یان وەك (کاهوو، سپێناغ):
*( Lettuce and spinach are ~ vegetables.)*

**league** (lēg), *n.* (١) پەیمان (لە نێو وڵاتان، یانە، کۆمەڵە، یا تیپدا).
(٢) (ا) یەکێتی (نێوان وڵاتان).
(ب) یەکێتی (نێوان تیپی وەرزش، یانە، ڕێکخراو، یا مرۆڤدا).

*v.t. & v.i.* یەککرتن؛ بوون بە یەك

**in league,** هاوپەیمان: *( He is in league with the enemy.)* .

**league** (lēg), *n.* (١) پێوانەیەکی دوورییە بریتییە لە سێ میل (لە هەندێ وڵاتیشدا چوار)؛ فرسەخ. (٢) دووجای ئەم پێوانەیە.

**leaguer** (lē′gēr), *n.* (١) گەمارۆ؛ گەمارۆدان. (٢) لەشکری گەمارۆدەر
(٣) ئۆردوگای ئەم جۆرە لەشکرە.

**leaguer** (lē′gēr), *n.* ئەندامی یەکێتییەك (هی نێو وڵاتان، یانە، ڕێکخراو، تیپی وەرزش... هتد)؛ هاوپەیمان.

**leak** (lēk), *v.i.* (١) تکەکردن؛ دڵۆپەکردن؛ دەڵاندن
(٢) ( ~ in; ~ out ): لێ چوون (ئاو، هەوا)؛ دادان؛ دەربازبوون؛ تێ چوون.
(٣) ئاشکرابوون؛ دەرکەوتن؛ درکان: *( The truth ~ed out.)* .

*v.t.* (١) ڕێ دان بە لێ چوون یا تێ چوونی ئاووهەوا؛ فشکردنەوە.
(٢) درکاندن؛ ئاشکراکردن؛ دەرخستن: *( to ~ secrets or information)* .

*n.* (١) درز؛ کون؛ کەلەبەر
(٢) تکە؛ دڵۆپە؛ دەڵان: *( a ~ in the roof)*
(٣) (ا) دەربازبوون و لەکیس چوونی ووزەی ئەلەکتریکی.
(ب) جێی ئەم دەربازبوونە. (٤) (ا) درکانی دەنگوباسی نهێنی (بە دەستەنقەست یا بەبێ دەستەنقەست). (ب) دەنگوباسی درکێنراو.
(ج) درکێنەری ئەم دەنگوباسە؛ سەرچاوەی ئەم درکاندنە

**leakage** (lēk′ij), *n.* (١) دڵۆپە؛ دڵۆپەکردن؛ تکە
(٢) شتی لێ چوو یا تێ چوو (شلە، هەوا)
(٣) ئەو برەی لە دەفرێك دەچێت یا تێی دەچێت.
(٤) ئەو برەی کە وا دادەنرێت لەکیس دەچێت لە گواستنەوەی شلەدا بە لێچوونی لە دەفر (بازرگانی).

**leaky** (lēk′i), *adj.* (١) تکەکەر؛ دڵۆپەکەر: *( a ~ roof)* .
(٢) [Colloq.]؛ دەم دراو.

-leakiness *(n.).*

**lean** (lēn), *v.i.* (١) لاربوونەوە؛ خواربوونەوە؛ چەمینەوە.
(٢) شان لەسەر دادان؛ دەست پێوەگرتن؛ پاڵ پێوەدان:
*( He ~ed on the desk.; ~ing against the railing)*
(٣) ( ~ on; ~ upon )، پشت پێ بەستن: *( L~ on me for help.)* .
(٤) لایەنگیری کردن؛ پاڵپشتی کردن؛ بەلاوە باشتر بوون:
*( You ~ toward state control of education.)*
(٥) [Colloq.]، ( ~ on )، زۆر بۆ هێنان؛ زۆرلێکردن؛ بەگیرهێنان:
*( Their boss is ~ing on them.)*

**lean** (lēn), *adj.* (١) لەر؛ لاواز؛ ڕەقەڵە؛ بارێك.
(٢) بێ چەوری (گۆشت): *( ~ meat)* .
(٣) کەم (قازانج، بەر، بووجە، سەرمایە): *( a ~ budget)* .

*n.* گۆشتی بێ چەوری.

**leaning** (lēn′iŋ), *n.* (١) لاری؛ خواری؛ لاربوونەوە.
(٢) مەیل؛ ئارەزوو؛ لایەنگری.

**leant** (lent), *alternative past tense and p.p. of* **lean.**

**leap** (lēp), *v.i.* قەڵەمبازدان؛ بازدان؛ قونەکردن؛ هەڵبەزینەوە.

*v.t.* (١) قەڵەمبازدان بەسەردا؛ باز بەسەردا دان.
(٢) بازدپێدان: *( He ~ed his horse over the wall.)* .

*n.* (١) قەڵەمباز؛ باز؛ قونە؛ هەڵبەزینەوە. (٢) مەودای قەڵەمباز.
(٣) ئەو شوێنەی بازی لێوە دەدرێت؛ شت یا شوێنی باز بەسەردا دراو.
(٤) گۆڕینێکی کوتوپڕی
(٥) قۆستنەوە؛ بە پەرۆشەوە بوون بۆ هەل بۆ هەڵکەوتن (بۆ کردنی شتێك)؛ یەکودوو لێ نەکردن: *( to ~ at the chance to do something)*

**a leap in the dark,** کارێکی پڕ مەترسی؛ کارێکی ئەنجام نەزانراو.

**by leaps and bounds,** ئێجگار زۆر؛ زۆر خێرا (پێشکەوتن، پەرەسەندن):
*( His business is growing by leaps and bounds.)*

**leapfrog** (lēp′frôg′, lēp′frog′), *n.* یەکەو حەیزەران؛ یەکەو گۆتەکە.

*v.t. & v.i.* بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن یا قەڵەمبازدان وەك لە یەکەو گۆتەکەدا.

**leapt** (lept, lēpt), *alternative past tense and p.p. of* **leap.**

**leap year,**ساڵی پڕ؛ ٣٦٦ ڕۆژ.

**learn** (lŭrn), *v.t.* (١) فێربوون. (٢) ڕەوان کردن.
(٣) بیستن؛ زانین؛ پێ زانین: *( I ~ed that he had been sick.)*
(٤) بۆ دەرکەوتن.
(٥) عارنان: *( I've learnt my lesson.)* .
(٦) فێربوون (خوو، هەڵوێست): *( You have ~ed humility.)* .
(٧) فێرکردن (بەم مانایە ئێستا هەر نەخوێندەوار بەکاری دەهێنێ).

*v.i.* (١) فێربوون. (٢) بیستن؛ پێ زانین؛ زانین.

**learned** (lŭr′nid), *adj.* (١) زانا؛ بزان؛ زۆر تێگەیشتوو؛ دانا:
*( a ~ man)*
(٢) زانایانە؛ تایبەتی بە زانایان؛ زانیاری (گۆڤار، ڕێکخراو):
*( a ~ society, journal, etc.)*

**learning** (lŭr′niŋ), *n.* (١) فێربوون. (٢) زانیاری؛ زانست.

**learnt** (lŭrnt), *alternative past tense and p.p. of* **learn.**

**leary** (lêr′i), *adj.* = leery.

**leasable** (lēs′ə-b'l), *adj.* بەکرێ دەدرێت (بەتایبەتی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و بەتایبەتی خانوو زەوی‌وزار)؛ بەکرێ دەگیرێت.

**lease** (lēs), *n.* (١) کرێ نامە (خانوو زەوی‌وزار)؛ قۆنتەراتی بەکرێدان یا بەکرێ گرتن. (٢) ماوەی بەکرێدان یا بەکرێ گرتن (خانوو زەوی‌وزار).
(٣) خانوو زەوی‌وزاری بەکرێ دراو.

*v.t.* (١) بەکرێدان (خانوو زەوی‌وزار). (٢) بەکرێ گرتن (خانوو زەوی‌وزار).
**a new lease on life,** ژیان نوێ بوونەوە (لە ئەنجامی لە نەخۆشی چاکبوونەوە، مەراق نەمان، یا ڕزگار بوون لە کارەساتێك).
**lease-holder** (lēs'hōl'dēr), *n.* کرێچی (خانوو زەوی‌وزار)؛ کرێ گرتە
**leash** (lēsh), *n.* (١) ڕەشوە؛ ڕەشمە؛ جڵەو؛ هەوسار؛ پەت.
(٢) دابینکردن؛ جڵەوگیری: *( kept in ~ )*
(٣) سێ سەگ. کەروێشك... هتد (ڕاوکردن)؛ دەستەی سێ‌یانە.
*v.t.* (١) ڕەشوەکردن؛ ڕەشمە کردنەسەر؛ بەستنەوە؛ پەت کردن.
(٢) جڵەوگرتن؛ دابینکردن.
**hold in leash,** دابینکردن؛ جڵەوگرتن.
**strain at the leash,** سەرکێشی کردن؛ بێ ئارامی نواندن
**least** (lēst), *adj.* کەمترین
*adv.* بە کەمترین
*n.* کەمترین
**at (the) least,** (١) بەلای کەمەوە؛ هیچ نەبێ. (٢) هەرچۆنێك بێ.
**not in the least,** هیچ؛ بە هیچ جۆرێك؛ بە هیچ ڕادەیەك:
*( I'm not in the least tired.)*
**leastways** (lēst'wāz'), *adv.* [Dial.], = **leastwise.**
**leastwise** (lēst'wīz'), *adv.* [Colloq.], = **at least.**
**leather** (le*th*'ēr), *n.* (١) چەرم؛ پێستەی خۆش کراو؛ قایش؛ پێستەی دەباخ کراو. (٢) شتومەکی لە چەرم دروستکراو؛ شتی چەرم.
*adj.* چەرم؛ لە چەرم دروستکراو؛ چەرمین.
*v.t.* (١) چەرم تێگرتن. (٢) بە قامچی لێدان؛ قامچی پیادان.
**leatherback** (le*th*'ēr-bak'), *n.* جۆرە کیسەڵێکی دەریایی گەورەیە
**leathern** (le*th*'ērn), *adj.* (١) چەرمین؛ چەرم؛ لە چەرم دروستکراو. (٢) لە چەرم دەچێت.
**leatherneck** (le*th*'ēr-nek'), *n.* [Slang], سەرباری هێزی دەریایی ئەمەریکی
**leatheroid** (le*th*'ēr-oid'), *n.* چەرمی دەستکرد.
**leathery** (le*th*'ēr-i), *adj.* چەرمی؛ وەك چەرم وایە؛ نەرمو جیڕ.
**leave** (lēv), *v.t.* (١) هێشتنەوە؛ نەبردن؛ لێ بەجێهێشتن.
(٢) بەجێهێشتن (شوێنەوار، پاشماوە، نیشانە جێ)
(٣) لە دوای خۆ بەجێهێشتن؛ لە دوا بەجێمان:
*( The deceased ~s a widow and two children.)*
(٤) بۆ بەجێهێشتن (لە وەسیەتنامەدا):
*( She left her fortune to charity.)*
(٥) ( ~ to; ~ up to )، پێ سپاردن (لێپرسراو)؛ ڕێ پێدان بۆ بڕیاردان:
*( I will ~ that to you.; She ~s such decisions up to me.)*
(٦) مانەوە (ژمێرە): *( Ten minus two ~s eight.)*
(٧) نەویستن؛ بەجێهێشتن: *( Here is my proposal- take it or ~ it.)*
(٨) بەجێهێشتن (شوێن)؛ ڕۆیشتن؛ ڕۆین:
*( we will ~ town tomorrow.)*
(٩) بەجێهێشتن لە دوای خۆ (مرۆڤ، شت):
*( I left him there.; She left it in the car.)*
(١٠) وازلێهێنان؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ دەست لێ بەردار بوون
(١١) خۆ لێ کشانەوە؛ وازهێنان؛ دەست هەڵگرتن
(١٢) [Slang] هێشتن؛ ڕێ پێدان
*v.i.* ڕۆیشتن؛ ڕۆین
**leave off,** (١) وەستان؛ دەست هەڵگرتن.
(٢) تەرك کردن؛ وازهێنان: *( leave off alcohol)*
**leave one alone,** بەرۆك بەردان؛ لێ گەڕان؛ وازلێهێنان؛ لە کۆڵ بوونەوە:
*( Leave me alone, please.)*
**leave out,** پەڕاندن؛ لەبیرچوونەوەو باس نەکردن:
*( to leave out a letter, some names, an important item. unnecessary details, etc.)*
**leave word (with),** ڕاسپاردن؛ پەیام بۆ بەجێهێشتن:
*( I will leave word with my neighbour to open the door for you and let you in my house.)*
**leave** (lēv), *n.* (١) ماوە؛ ماوەپێدان؛ ڕێ پێدان؛ ڕێ پێ دران.
(٢) ووچان؛ پشوو؛ ماوە دان بۆ ووچان گرتن.
(٣) ماوەی ئەم ووچانە.
**beg leave,** داوای ماوەدان کردن؛ داواکردن بە ڕێ پێدان.
**by your leave,** بە یارمەتی تۆ؛ ئەگەر ڕێم پێ دەدەیت.
**on leave,** لە ووچاندایە؛ لە ووچانە.
**take leave of,** خواحافیزی لێکردن.
**take one's leave,** ڕۆیشتن؛ خواحافیزی کردنو ڕۆیشتن.
**leave** (lēv), *v.i.* گەڵاکردن؛ گەڵاگرتن.
**leaved** (lēvd), *adj.* (١) گەڵای پێوەیە؛ گەڵای کردووە.
(٢) جۆرێك یا ژمارەیەکی تایبەتی گەڵای پێوەیە: *( narrow- ~ )*
**leaven** (lev''n), *n.* (١) هەویرترش؛ هەوێن.
(٢) بیروڕایەك یا کارێك کە ووردە ووردە شت دەبزوێنێ و دەژێنێتەوەو جۆشی تێ دەخات.
*v.t.* (١) هەویرترش تێکردن؛ هەویر هەڵهاتن؛ هەوێن تێکردن.
(٢) ژیاندنەوەی بەرە بەرە؛ پیا بڵاوبوونەوەو بزواندن یا جۆش تێخستن.
**leave of absence,** ووچان؛ ووچان پێدان.
**leaves** (lēvz), *n. plural of* **leaf.**
**leave-taking** (lēv'tāk'iŋ), *n.* خواحافیزی کردن؛ خواحافیزی؛ ڕۆیشتن.
**leavings** (lēv'iŋs), *n.pl.* پاشماوە؛ خڵتە؛ پاشەڕۆك؛ کەنوکوو؛ زبڵ.
**Lebanese** (leb'ə-nēz'), *adj.* لوبنانی (گەل، کلتوور).
*n.* لوبنانی؛ کەسێکی لوبنانی.
**lecher** (lech'ēr), *n.* پیاوێکی داوێن پیس؛ چاوچنۆس.
**lecherous** (lech'ēr-əs), *adj.* داوێن پیس؛ چاوچنۆس.
**-lecherously** *(adv.)*; **lecherousness** *(n.)*.
**lechery** (lech'ēr-i), *n.* داوێن پیسی؛ چاوچنۆسی.
**lectern** (lek'tērn), *n.* (١) مێزی ئینجیل لێوە خوێندنەوە لە کڵێسەدا.
(٢) دووانگە؛ مێزی دوواندەر؛ سێپای ووتار خوێندنەوە.
**lection** (lek'shən), *n.* (١) خوێندنەوەی ئینجیل لە کڵێسەدا لەکاتی نوێژدا. (٢) خوێندنەوەی دەقی نووسراوێکی جیا لە دەقێکی تری هەمان نووسراو.
**lectionary** (lek'shən-er'i), *n.* لیستەی ئەو بەشانەی ئینجیل کە دەخوێنرێنەوە لە کڵێسەدا لەکاتی نوێژدا.
**lector** (lek'tēr), *n.* (١) خوێندەرەوەی ئینجیل لە کڵێسەدا لەکاتی نوێژدا.
(٢) وانەوانی هەندێ زانکۆ.
**lecture** (lek'chēr), *n.* (١) وانە.
(٢) سەرزەنشتێکی دوورودرێژ: *( to give someone a ~ )*
*v.i.* وانە بێژان؛ وانە دان.
*v.t.* (١) وانە بێژان؛ وانە بۆ دان. (٢) سەرزەنشتکردن بە دوورودرێژی
**lecturer** (lek'chēr-ēr), *n.* وانەوان؛ وانەبێژ؛ مامۆستا.
**lectureship** (lek'chēr-ship'), *n.* وانەبێژی؛ پلەی وانەوان
**led** (led), *past tense and past participle of* **lead.**
**ledge** (lej), *n.* (١) لێواری پەنجەرە یا ڕەفە؛ ڕەفە.
(٢) (ا) لووتکەی شاخ؛ لووتکەی بەرد. (ب) تیرە بەردی ژێر ئاوی کەنار دەریا
(٣) تیرە بەردی کانزاداری ژێرزەمین.
**ledger** (lej'ēr), *n.* (١) تەختەبەردی سەر گۆڕ.
(٢) بڕەداری ئاسۆیی سێدارە. (٣) دەفتەری ژمێریاری؛ دەفتەری ژمێرە
**ledger board,** تەختەداری سەر تەیمانی پێ پلیکانەو تەلارو شوێنی تر.
**lee** (lē), *n.* (١) پەنا؛ پەناگا؛ جێی پەنا (٢) شوێنێك کە با نەیگرێتەوە.
(٣) ئەو دیوەی کەشتیو بەلەم کە با نایگرێتەوە.

***adj.*** بانەگرەوە؛ تایبەتی بە دیوی بانەگرەوە.
**leech** (lēch), ***n.*** (١) پزیشك. (٢) زاروو؛ زەروو؛ زالوو.
(٣) مفتخۆر؛ لاوورگە؛ لاكوت؛ هەوانتەخۆر؛ ناخوونەككەر؛ مشەخۆر.
***v.t.*** (١) چارەكردن؛ چاككردنەوە؛ دەرمان كردن.
(٢) خوێن گرتن بە زەروو؛ خوێن بەردان بە زالوو
***v.i.*** لاكوتی كردن؛ مفتخۆری كردن؛ ناخوونەك كردن.
**leech** (lēch), ***n.*** قەراغی دەرەوەی بایەوان؛ قەراغی ستوونی بایەوان.
**leek** (lēk), ***n.*** سەوزەیەكە لە توخمی تەرە پیازە گەڵاكانی لە كەوەر دەچێت، بەڵام زۆر پانترە
**leer** (lêr), ***n.*** سەیركردنێكە بە لاتیلەی چاو و بە بزەوە بە نیازی پیس و ناپەسەندانە یا تەماع كردنە ئافرەتێك یا شتێك.
***v.i.*** تەماشاكردن بەم جۆرە:
***( The nasty old man ~ed on the young girl.)***
**leery** (lêr′i), ***adj.*** *Also* leary, [Colloq.], بە ترس؛ بە گومان:
***( I am ~ of people like him.)***
**lees** (lēz), ***n.pl.*** خلتە؛ تلپی نیشتوو؛ نیشتووی بن دەفر.
**lee shore,** ئەو كەنار دەریایەی بەرەو ئەوێ با هەڵدەكات.
**leeward** (lē′wērd), ***adj., n., & adv.*** بەرەو ئەو لایەی كە با بۆی هەڵدەكات
**leeway** (lē′wā′), ***n.*** (١) (أ) لادانی كەشتی و فڕۆكە لە ڕێی ڕاستی خۆیان بەهۆی باوە. (ب) گۆشەی ئەم لادانە.
(٢) [Colloq.]، مەودای لادانی ڕێ پێدراو (پارە خەرج كردن، كات بردنەسەر، كاروبار هەڵسووڕاندن، ڕەفتار نواندن)؛ سەربەستی كردنی شت بە دڵی خۆ:
***( With this tight schedule I don't have much ~ .)***
**left** (left), ***adj.*** (١) چەپ (٢) چەپڕەو (ڕامیاری).
***n.*** (١) لای چەپ؛ چەپ. (٢) مستەكۆڵەیەك بە دەستی چەپ (بۆكسبازی).
(٣) [the L.-]؛ حیزب، كۆمەڵە، یا هەڵوێستێكی چەپڕەو.
***adv.*** بەرەو چەپ؛ بە لای چەپدا.
**left** (left), *past tense and past participle of* **leave.**
**left-handed** (left′han′did), ***adj.*** (١) چەپلەر؛ چەپە
(٢) بەدەستی چەپ كراو. (٣) ناكارامە؛ گێل؛ كەلحۆ؛ گێژ.
(٤) نادڵسۆز؛ نابەدڵ؛ مەبەست خراپ: ***( a ~ compliment)*** .
(٥) **morganatic** .
(٦) بۆ دەستی چەپ كراوە؛ بە دەستی چەپ بەكاردەهێنرێ.
(٧) لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەسووڕێتەوە (بە دژی دەسی كاتژمێرەوە).
***adv.*** بە دەستی چەپ: ***( He writes ~ .)*** .
**leftism** (lef′tiz'm), ***n.*** چەپڕەوی (ڕامیاری).
**leftist** (lef′tist), ***n.*** چەپڕەو (ڕامیاری)؛ چەپڕۆ.
**leftover** (left′ō′vēr), ***n. & adj.*** بەرماوە؛ پاشماوە؛ چێشتی كۆن؛ پاشەڕۆك
**left wing,** *Also* **Left Wing,** چەپڕەو (حیزب، كۆمەڵە)؛ چەپی (ڕامیاری).
**-left-wing** ***(adj.).***
**left-winger** (left′wiŋ′ēr), ***n.*** چەپڕەو (مرۆڤ)؛ ئەندامی حیزب یا كۆمەڵەیەكی چەپڕەو.
**lefty** (lef′ti), ***n.*** [Slang], كەسێكی چەپلەر
**leg** (leg), ***n.*** (١) لاق؛ لنگ (٢) لنگی شەرواڵ و پانتۆڵ.
(٣) شتێك كە لە لاق بچێ : (أ) لاق یا پێچكە (كورسی، مێز).
(ب) لاقی سێپاو پرگال.
(٤) قۆناغ ***( the last ~ of our trip)*** .
(٥) یەكێك لە دوولا ستوونییەكەی سێگۆشەیەك.
***v.i.*** [Colloq.], ( ~ it ), بە پێ ڕۆیشتن؛ ڕاكردن
**give a leg up,** [Colloq.], پاڵ پێوەنان؛ یارمەتیدان؛ هاندان.
**have not a leg to stand on,** [Colloq.], هیچ بەڵگەو بیانوویەكی نییە بۆ هەڵوێستێك یا كردەوەیەك.
**on one's last leg,** [Colloq.], زۆر بە بەرەوە نەمان؛ زۆری نەماوە (بۆ مردن، ژێركەوتن، نابووت بوون، یا ماندوو بوون)؛ باری شلۆقە.
**pull one's leg,** [Colloq.], گاڵتە لەگەڵ كردن؛ درۆ لەگەڵ كردن هەر بۆ گاڵتە:
***( I was pulling your leg when I told you about winning a lottery.)***
**shake a leg,** [Slang], (١) پەلەكردن. (٢) سەماكردن
**legacy** (leg′ə-si), ***n.*** (١) میراتی؛ جێماوە.
(٢) كەلەپوور؛ پاشماوەی دێرین؛ نەریت.
**legal** (lē′g'l), ***adj.*** (١) یاسایی؛ درووست؛ ڕێ دراو: ***( a ~ act)*** .
(٢) تایبەتی بە پارێزەران و دادپرسان: ***( ~ ethics)*** .
(٣) لە ڕووی یاساوە؛ بەپێی یاسا: ***( a ~ offense)*** .
(٤) تایبەتی بە تەورات. (٥) حەڵاڵ.
**legal cap,** كاغەزی نووسینی پارێزەر.
**legalism** (lē′g'l-iz'm), ***n.*** پەیڕەوی كردنی كوێرانەی یاسا.
**-legalist** ***(n.)***; **legalistic** ***(adj.)***; **legalistically** ***(adv.).***
**legality** (li-gal′ə-ti), ***n.*** (١) دروستێتی؛ یاسایەتی؛ بەپێی یاسایەتی شتێك: ***( the ~ of his act)*** .
(٢) پەیڕەوی كردنی یاسا.
(٣) شت یا هەنگاوی پێویست بەپێی یاسا
**legalize** (lē′g'l-īz′), ***v.t.*** (١) ڕێ پێدان بەپێی یاسا؛ درووستكردن: ***( to ~ abortion)***
(٢) حەڵاڵ كردن؛ بەپێی یاسا كردن.
**-legalization** ***(n.).***
**legally** (lē′g'l-i), ***adv.*** لە ڕووی یاساوە؛ لە باری یاساوە؛ بەپێی یاسا.
**legal tender,** چەشنی پارە كە بەپێی یاسا دەبێت خاوەن قەرز وەری بگرێت لە وەرگرتنەوەی قەرزەكەیدا:
***( Dimes are a ~ for any sum up to ten dollars.)***
**legate** (leg′it), ***n.*** باڵیۆزی پاپا؛ نوێنەری دبلۆماسی (بەتایبەتی هی پاپا).
**-legateship** ***(n.).***
**legatee** (leg′ə-tē′), ***n.*** میراتگر؛ میراتبەر.
**legation** (li-gā′shən), ***n.*** (١) نوێنەری دبلۆماسی ناردن.
(٢) ئەركی پێ سپێردراوی ئەم نوێنەرە.
(٣) دەزگایەكی دبلۆماسییە پلەیەك لەخوار باڵیۆزخانەوەیە.
(٤) سەرۆكی ئەم دەزگایەو فەرمانبەرەكانی.
(٥) فەرمانگەی ئەم دەزگایە.
**legend** (lej′ənd), ***n.*** (١) داستان؛ ئەفسانە. (٢) كۆمەڵە داستان.
(٣) كەسێكی زۆر بەناوبانگ یا شتێك كە دەبێتە داستان؛ كەسێكی ئەوەندە لێهاتووە كە وەك ئەفسانەی لێ دێت.
(٤) ناونیشانێكی هەڵكەنراوە لەسەر سكەیەك یا دروشمێكی خانەدانی.
(٥) تێبینی ڕوونكەرەوەی نەخشە یا وێنەیەك.
**legendary** (lej′ən-der′i), ***adj.*** داستانی؛ ئەفسانەیی؛ ئەفساناوی: ***( a ~ figure in Kurdish history)***
**legendry** (lej′ən-dri), ***n.*** سەرجەمی داستان یا ئەفسانەكان.
**legerdemain** (lej′ēr-di-mān′), ***n.*** (١) دەست سووكی؛ فێڵ و تەڵەكەی جادووگەر؛ جادووگەری. (٢) فێڵ و تەڵەكە؛ تەڵەكەبازی؛ فێڵ؛ ساختە؛ فڕوفێڵ.
**leggy** (leg′i), ***adj.*** (١) لاق درێژ لە ئەندازە بەدەر: ***( a ~ colt)*** .
(٢) [Colloq.]، لاق جوان و درێژ (ئافرەت). (٣) لاسك درێژ.
**legible** (lej′ə-b'l), ***adj.*** ڕوون (دەستنووس)؛ بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە؛ دەخوێنرێتەوە: ***( ~ handwriting)*** .
**-legibility** ***(n.)***; **legibleness** ***(n.).***
**legibly** (lej′ə-bli), ***adv.*** بە جۆرێك كە بخوێنرێتەوە (دەستنووس)؛ بە ڕوونی: ***( Please, write ~ .)***

**legion** (lē′jən), *n.* (١) لقێکی لەشکری ڕۆمانی (لەنێوان سێ هەزار تا
شەش هەزار سەربازدا). (٢) ئۆردو؛ لەشکر. (٣) ژمارەیەکی زۆر؛ گەلێك.
(٤) [L-]، یەکێتی جەنگاوەرانی کۆن؛ ڕێکخراوی سەربازانی کۆن.

**legionary** (lē′jən-er′i), *adj.* ئۆردویی؛ لەشکری.
*n.* (١) ئەندامی ئۆردو؛ ئەندامی لەشکرێك.
(٢) ئەندامی ڕێکخراوێکی جەنگاوەرانی کۆن.

**legionnaire** (lē′jən-âr′), *n.* (١) ئەندامی لەشکرێك یا ئۆردویەك.
(٢) [L-]، ئەندامێکی ڕێکخراوی سەربازانی کۆن.

**Legion of Honor,** خەڵاتێکی بەرزی فەرەنسییە بۆ سەربازان.

**Legion of Merit,** خەڵاتی لێهاتوویی. خەڵاتێکی بەرزی ئەمەریکییە
بۆ سەربازان

**legislate** (lej′is-lāt′), *v.i. & v.t.* یاسادانان

**legislation** (lej′is-lā′shən), *n.* (١) یاسادانان. (٢) یاسا؛ قانون.

**legislative** (lej′is-lā′tiv), *adj.* (١) یاسasازی؛ یاسادانان:
*( ~ powers, functions; the ~ branch of government)*
(٢) دەسەڵاتی یاسادانان: *( a ~ assembly)* .
(٣) لە ڕێی یاسادانانەوە کراو.
*n.* لقی یاساسازی میری؛ دەستەی یاسادانەران؛ پەرلەمان؛ ئەنجومەنی نوێنەران.

**legislator** (lej′is-lā′tēr), *n.* یاسادانەر؛ ئەندامی دەستەی
یاسادانەران؛ ئەندامی پەرلەمان.

**legislature** (lej′is-lā′chēr), *n.* ئەنجومەنی یاسادانەران؛ پەرلەمانی
یەکێك لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا؛ ئەنجومەنی یاسادانان؛
ئەنجومەنی یاساسازی.

**legist** (lē′jist), *n.* یاسازان؛ پسپۆری یاسا.

**legit** (li-jit′), *n.* [Slang], شانۆنامەی پەسەند
*adj.* [Slang], = **legitimate.**

**legitimacy** (li-jit′ə-mə-si), *n.* ڕەوایی؛ دروستی؛ دروستێتی؛
پەسەندی؛ بەجێیی *( The ~ of a government, claim, purpose)* .

**legitimate** (li-jit′ə-mit), *adj.* (١) حەڵاڵ زادە: *( a ~ child)* .
(٢) دروست؛ ڕەوا *( a ~ claim, purpose, etc.)* .
(٣) بەجێ؛ پەسەند *( a ~ reason for being absent)* .
(٤) ڕاستەقینە
(٥) (ا) دەستووری؛ بەپێی یاسا دانراوە: *( a ~ government)* .
(ب) بەپێی مافی میراتی بۆی ماوەتەوە؛ دەستووری: *( a ~ king)* .
(٦) پەسەند (شانۆنامە)؛ تایبەتی بە شانۆنامەیەك کە ناوکرۆکەکەی گرنگ بێت
نەك گاڵتەوگەپ *( ~ drama, theatre)* .
*v.t.* (١) (ا) بە ڕەوا دانان؛ ڕەواکردن (ب) حەڵاڵ کردن؛ دروستکردن.
(٢) کردن بە حەڵاڵ زادە (لە دادگا).
**-legitimately** *(adv.)*; **legitimation** *(n.)*.

**legitimatize** (li-jit′ə-mə-tīz′), *v.t.* = **legitimize.**

**legitimist** (li-jit′ə-mist), *n.* لایەنگری دەسەڵاتی دەستووری
بەتایبەتی هی کەسێك کە داوای پادشایەتی دەکات چونکە بە میراتی بۆی
ماوەتەوە
**-legitimism** *(n.)*.

**legitimize** (li-jit′ə-mīz′), *v.t.* بە ڕەوا پیشاندان؛ ڕەواکردن؛
بەڵگە بۆ هێنانەوە *( to ~ a claim, right, situation, etc.)* .

**legume** (leg′ūm, li-gūm′), *n.* (١) ڕووەکی پاقلەیی؛
پاقلەو توخمەکەی (لۆبیا، فاسۆلیا، نۆك... هتد)
(٢) کەلووی پاقلەو توخمەکەی.
(٣) تۆوی پاقلەو توخمەکەی.

**leguminous** (li-gū′mi-nəs), *adj.* پاقلەیی؛ کەلوودار؛
تایبەتی بە ڕووەکی کەلوودار.

**leg work,** [Colloq.]. ئەرکی پیادە؛ پیادەکار؛ ئەرکێك یا کارێکە کە
بە پێ ڕۆیشتن جێبەجێ دەکرێت (وەك: دەنگوباس کۆکردنەوە بۆ ڕۆژنامەو
تەلەفزیۆن و رادیو).

**leister** (lēs′tēr), *n.* ڕمی چنگاڵی (بۆ ڕاوەماسی).
*n.* ڕمی چنگاڵی گرتنە ماسی.

**leisure** (lē′zhēr, lezh′ēr), *n.* کاتی بەتاڵ؛ کاتی بێ ئیشی؛
ئاسوودەیی.
*adj.* (١) بەتاڵ (کات)؛ دەستبەتاڵ: *( ~ time)* .
(٢) ئاسوودەو بێ ئیش؛ خۆش گوزەران: *( the ~ class)* .
**at leisure,** (١) دەستبەتاڵ؛ بەتاڵ
(٢) لەسەرخۆ؛ بەبێ پەلەکردن؛ بە هێواشی؛ بە شێنەیی.
**at one's leisure,** کە دەست گەیی؛ لەکاتی دەستبەتاڵیدا؛
بە هەوەسی خۆ: *( Read this at your leisure.)* .

**leisured** (lē′zhērd, lezh′ērd), *adj.* (١) دەستبەتاڵ؛ ئاسوودەو
بێ ئیش. (٢) لەسەرخۆ؛ بە هێواشی؛ بە شێنەیی.

**leisurely** (lē′zhēr-li, lezh′ēr-li), *adj.* لەسەرخۆ؛ بە شێنەیی؛
بە هێواشی؛ بەبێ پەلەکردن؛ ئاسوودە: *( a ~ meal, drive, trip, etc.)*
*adv.* بە لەسەرخۆیی؛ بە شێنەیی.
**-leisureliness** *(n.)*.

**leitmotif, leitmotiv** (līt′mō-tēf′), *n.* بیری سەرەکی (لە چیرۆك،
هۆنراوە، یا شانۆنامەیەکدا کە زوو زوو دووبارە دەکرێتەوە وە چیرۆکەکە
دەبەستێت بەیەکەوە).

**leman** (lem′ən, lē′mən), *n.* [Archaic], (١) دڵدار (پیاو، ژن)؛
خۆشەویست. (٢) دۆست (ئافرەت).

**lemma** (lem′ə), *n.* (١) بەڵگەیەك یا بیرێکی پێ سەلمێنراوە بۆ
سەلماندنی بیرێکی گرنگتر بەکاردەهێنرێ. (٢) (ا) بیری ناوبراو لە سەرباسدا
(ب) ووشەی لە فەرهەنگۆکدا ڕوون کراوە.

**lemon** (lem′ən), *n.* (١) لیمۆ. (٢) دار لیمۆ.
(٣) ڕەنگی لیمۆیی؛ ڕەنگی زەرد
(٤) [Colloq.]، شتێکی قەڵب و بێ فەڕ؛ کچێکی ناشرین؛
کەسێك یا شتێکی بێ کەڵك و سەرنەکەوتوو:
*( The used car I bought was a ~ .)*
*adj.* (١) لیمۆیی (ڕەنگ)
(٢) تامی لیمۆ دەدات؛ لیمۆیی؛ بە لیمۆ کراو.

**lemonade** (lem′ən-ād′), *n.* ئاوی لیمۆ؛ خۆشاوی لیمۆ؛
شەربەتی لیمۆ.

**lemon drop,** نوقڵە لیمۆ.

**lemur** (lē′mēr), *n.* جۆرێکە لە مەیموون.

**lemures** (lem′yoo-rēz′), *n.pl.* خێوی شەوگەڕی مردووان
(ئەفسانەی ڕۆمانی).

**lend** (lend), *v.t.* (١) بە دەستیاو پێدان؛ بە ئەمانەت پێدان:
*( to ~ someone a book)*
(٢) قەرز پێدان.
(٣) پێدان؛ لێ زیادکردن؛ خۆشترو جوانترکردن:
*( A fire ~s cheer to a room.)*
(٤) دەستگیرۆیی کردن؛ یارمەتیدان؛ پێدان: *( to ~ a helping hand)*
*v.i.* قەرزدان.
**lend itself ( or oneself ) to,** ڕێگەدان؛ بۆ ئاسان کردن؛ گونجان؛ شیان:
*( The novel lends itself to reading.)*

**length** (leŋkth, leŋth), *n.* (١) درێژی؛ درێژایی. (٢) دووری.
(٣) ماوەی خایان؛ ماوەی پێ چوون؛ ماوە. (٤) دوورودرێژی.
(٥) پێوانەیەکە بریتییە لە درێژی شتێك یا گیاندارێك لە پێشبڕکێدا:
*( His boat won by two ~s.; Her horse won by a ~ .)*
(٦) درێژی یا ماوەی خایانی بێژانی تییە بزوێنێك
**at full length,** بەتەواوی ڕاکشاو (لەش).
**at length,** (١) لە ئاکامدا؛ لە دواییدا.
(٢) بە دوورودرێژی: *( We discussed the subject at length.)*
**go to any length,** هەوڵدان بەو پەڕی توانا؛ خۆ پێوە ماندووکردن؛

سڵ نەکردنەوە لە کردنی هیچ شتێك (بۆ دەسکەوتن یا جێبەجێکردنی شتێك).
**go to great ( or all ) lengths,** = go to any length.
**keep at arm's length,** دوورەپەرێز لێ وەستان؛ ساردی لەگەڵ نواندن؛ دوور ڕاگرتن: *( She tried to keep him at arm's length.)* .
**lengthen** (leŋk′th'n, leŋ′th'n), *v.t.* درێژکردنەوە؛ درێژکردن؛ درێژەپێدان
*v.i.* درێژبوونەوە؛ درێژبوون
**lengthily** (leŋk′thə-li, leŋ′thə-li), *adv.* بە دوورودرێژی
**lengthways** (leŋkth′wāz´, leŋth′wāz´), *adv. & adj.* -
**lengthwise.**
**lengthwise** (leŋkth′wīz´, leŋth′wīz´), *adv. & adj.* لەسەر باری درێژی؛ بە باری درێژی؛ بە درێژی
**lengthy** (leŋk′thi, leŋ′thi), *adj.* زۆر دوورودرێژ:
*( a ~ speech, lecture, discussion. etc.)*
**-lengthiness** *(n.).*
**lenience** (lē′ni-əns, lēn′yəns), *n.* = **leniency.**
**leniency** (lē′ni-ən-si, lēn′yən-si), *n.* (١) بەزەیی، دڵنەرمی؛ نەرمی (٢) کارێکی دڵنەرمانە.
**lenient** (lē′ni-ənt, lēn′yənt), *adj.* دڵنەرم؛ نەرم؛ بە بەزەیی؛ شل؛ جڵەو شلکەر: *( a ~ judge, teacher, parent, etc.)* .
**Leninism** (len′in-iz'm), *n.* بیروباوەڕو فەلسەفەی لینین.
**-Leninist; Leninite** *(n. & adj.).*
**lenitive** (len′ə-tiv), *adj.* ئازارکوژ؛ ئازاربڕ
*n.* دەرمانی ئازارکوژ
**lenity** (len′ə-ti), *n.* = **leniency.**
**lens** (lenz), *n.* (١) گەردبین؛ زەرەبین؛ شووشەی بینین (چاویلکە، کامێرا). (٢) پەردەیەکی ڕۆشنی چاوە لە پشتی ڕەشێنەی چاوەوە تیشك کۆدەکاتەوە.
**Lent** (lent), *n.* ماوەی ڕۆژوگرتن لە ئاینی خاچ پەرستیدا (بریتییە لە چل ڕۆژ).
**lent** (lent), *past tense and past participle of* **lend.**
**lenticular** (len-tik′yoo-lẽr), *adj.* (١) دوو ڕوو قۆقز (٢) گەردبینی
**lentigo** (len-tī′gō), *n.* (١) شڵ، کونج (٢) نیشانەیەکی زگماکی (وەك خاڵ).
**lentil** (len′t'l, len′til), *n.* (١) نیسك (٢) ڕووەکی نیسك.
**Leo** (lē′ō), *n.* (١) ناوی کۆ ئەستێرەیەکە. (٢) بورجی شێر.
**leonine** (lē′ə-nīn´), *adj.* شێرانە، وەك شێر.
**leopard** (lep′ẽrd), *n.* (١) بەور؛ پڵنگ. (٢) کەوڵی بەور یا پڵنگ (٣) وێنە یا پەیکەری شێرێکە لە لاوە و سەری بەرەو ڕووی تەماشاکەرە (وەك: شێری ئینگلیزی لەسەر درووشم یا شێری تر).
**leopardess** (lep′ẽr-dis), *n.* بەوری مێ، مێ پڵنگ.
**leotard** (lē′ə-tärd´), *n.* بەرگێکی یەك پارچەی تەنافبازو سەماکەرانە.
**leper** (lep′ẽr), *n.* کەڕ، گول، کەسێکی گەڕوگول.
**lepidopterous** (lep´ə-dop′tẽr-əs), *adj.* تایبەتی بە جانەوەری باڵ تەنکی پوولەکاری (وەك پەپوولە).
**lepidote** (lep′ə-dōt´), *adj.* بە پوونەکەو کاژ یا توێژاڵ داپۆشراو (ڕووەکناسی).
**leprechaun** (lep′rə-kôn´), *n.* جنۆکەیەکە بە خەزنەی شاراوە دەزانێ و هەر کەس بیگرێ پیشانی دەدات (ئەفسانەی ئیرلەندی).
**leprosarium** (lep´rə-sâr′i-əm), *n.* خەستەخانەی گەڕان.
**leprosy** (lep′rə-si), *n.* گەڕی، گەڕو گولی.
**leprous** (lep′rəs), *adj.* (١) گەڕ؛ گول. (٢) لە گەڕ دەچێت.
**lesbian** (lez′bi-ən), *adj.* پانپانۆکی کەر؛ قاشکەرو قاش کراو.
*n.* ئافرەتی پانپانۆکی کەر؛ ئافرەتێکە کە حەز لە ئافرەتی تر دەکات.
**lesbianism** (lez′bi-ən-iz'm), *n.* پانپانۆکێ؛ حەزکردنی ئافرەت لە ئافرەت
**lesion** (lē′zhən), *n.* (١) برین؛ زام؛ ئازار. (٢) برینی پێست. (٣) زیان پێ گەیشتنی ئەندامێکی لەش و لەکارکەوتنی.
**less** (les), *adj.* (١) کەمتر. (٢) بچووکتر؛ نزمتر (پلەوپایە)؛ خوارتر.
*adv.* کەمتر؛ بە ڕادەیەکی کەمتر.
*n.* هەندێکی کەمتر؛ بڕێکی کەمتر.
*prep.* ئەوەندەی لێ دەرچێ (ژمێرە): *( Five dollars ~ two.)* .
**-less** (lis), پاشگرێکە بەمانای: بێ؛ بە بێ:
*( pitiless, dauntless, relentless)*
**lessee** (les-ē′), *n.* کرێچی؛ کرێ گرتە.
**lessen** (les′'n), *v.t.* (١) کەمکردنەوە؛ کەمکردن. (٢) شکاندن؛ لە پلەوپایە کەمکردنەوە.
*v.i.* کەم بوونەوە؛ کەم بوون.
**lesser** (les′ẽr), *adj.* (١) کەمتر. (٢) بچووکتر؛ نزمتر (پلەوپایە)؛ خوارتر.
**lesson** (les′'n), *n.* (١) وانە (٢) بەش (پەڕتووکی قوتابخانە). (٣) شتێك کە فێربوونی پێویستە. (٤) پەند؛ فێربوونێکە لە ئەنجامی هەڵەکردندا:
*( I hope you've learned your ~ .)*
(٥) سەرزەنشت. (٦) بەشێکی ئینجیل (کە لە کڵێسەدا دەخوێنرێتەوە).
*v.t.* (١) فێرکردن؛ وانە پێ ووتنەوە. (٢) سەرزەنشتکردن.
**lessor** (les′ôr, les-ôr′), *n.* بەکرێدەر بەپێی قۆنتەرات (خانوو- زەوی‌وزار)؛ خاوەن خانوو زەوی‌وزاری بەکرێ دراو.
**lest** (lest), *conj.* (١) نەکو؛ نەبادا؛ لەترسی ئەوەی کە:
*( We spoke very low ~ we should wake her up.)*
(٢) کە: *( We were afraid ~ he should get here too late.)*
**let** (let), *v.t.* (١) وازلێهێنان؛ بەجێهێشتن؛ دەست لێ هەڵگرتن:
*( ~ alone; ~ be )*
(٢) (ا) بەکرێدان (خانوو زەوی‌وزار). (ب) بە قۆنتەرات کار پێدان.
(٣) بەردان (خوێن)؛ ڕشتن: *( ~ blood)* .
(٤) ماوە پێدان؛ ڕێ دان: *( Will you ~ me smoke?)* .
(٥) با؛ بام: *( ~ us go.; L~ me hear from you.)* .
*v.i.* بەکرێ دران: *( This apartment ~s for $400.00 a month.)* .
**let alone,** (١) بەرۆك بەردان؛ لە کۆڵ بوونەوە؛ وازلێهێنان. (٢) ئەوە هەر هیچ؛ ئەوە هەر باسی مەکە؛ نەخوازەڵا:
*( We couldn't even hold our ground, let alone advance.)*
**let down,** (١) نزم کردنەوە؛ شۆڕکردنەوە؛ هێنانەخوارەوە. (٢) پشت لێکردنەوە؛ بە ئاسانی گرتن. (٣) نائومێد کردن؛ دڵشکست کردن؛ هەناسە سارد کردن.
**let go,** بەرەڵاکردن؛ دەست لێ بەرەڵاکردن؛ وازلێهێنان.
**let go of oneself,** پەت بۆ خۆ شل کردن؛ دەست لە خۆ بەردان.
**let in,** ڕێی هاتنەژوورەوە دان.
**let loose,** بەرەڵاکردن؛ بەردان.
**let off,** (١) لێ هاتنەدەرەوە: *( to let off steam )* .
(٢) بەردان (کرێکار)؛ پایدۆس لێکردن: *( Let the workmen off early.)*
(٣) بەرەڵاکردن بە بێ سزا یان بە سزایەکی کەم.
(٤) دابەزاندن: *( Let me off here.)* .
**let on,** [Colloq.], وا خۆ پیشاندان؛ وا پیشاندان.
**let out,** (١) بەردان (ئاور شلەی تر).
(٢) لێ بەربوونەوە؛ کردن؛ لێ هاتنەدەرەوە: *( The dog let out a Yelp.)* .
(٣) بەکرێدان.
(٤) درکاندن (نهێنی)؛ ئاشکراکردن: *( who let that story out?)* .
(٥) درێژکردن یا پان کردنی جل‌وبەرگ بە کردنەوەی دامێن یا تیکەکەی.

(٦) [Colloq.]، بەردان (قوتابخانە)؛ پایدۆس لێکردن.

**let up,** (١) پشت لێکردنەوە؛ فەرامۆش کردن.

(٢) وەستان؛ هێواش کردنەوە: *( The storm didn't let up.)* .

**let up on,** [Colloq.]. بە ئاسانتر لەگەڵ جوولانەوە؛ جڵەو نەختێ بۆ شل کردن.

**let** (let), *v.t.* [Archaic]. نەهێشتن؛ رێ لێگرتن؛ وەستاندن؛ بەربەستکردن.

*n.* (١) کۆسپ؛ قۆرت.

(٢) دووبارەکردنەوەی " سێرڤ " (یاری تەنس).

**-let** (lit), پاشگرێکە بەمانای: بچکۆلە؛ بچووك: *( ringlet)* .

**let-down** (let′doun′), *n.* (١) خاوبوونەوە؛ پشت لێکردنەوە.

(٢) نائومێدی؛ دڵشکستی. (٣) نزم بوونەوەی فڕۆکە لەپێش نیشتنەوەیدا.

**lethal** (lē′thəl), *adj.* کوشندە؛ بکوژ؛ ژەهراوی:

*( a ~ injection; ~ gas, weapons, etc.)*

**lethargic** (li-thär′jik), *adj.* (١) خاو؛ سست؛ بێ تاقەت؛ بێ ووزە؛ خەواڵوو؛ لەش داهێزراو. (٢) سستکەر؛ بێ تاقەت کەر؛ خاوکەرەوە؛ لەش داهێزەر

**lethargy** (leth′ẽr-ji), *n.* (١) نوستنی دوورو درێژو ناسرووشتی؛ نوستنێکی وەك سڕبوون. (٢) خەواڵوویی؛ سستی؛ خاوی؛ خاووخلیچکی؛ بێ هێزی؛ بێ تاقەتی. (٣) بێباکی؛ هیچ گوێ نەدان

**Lethe** (lē′thi), *n.* (١) ڕووباری لەبیرچوونەوە (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان)

(٢) لەبیرچوونەوە؛ هیچ لەبیر نەمان.

**let's** (lets), = let us. با ئێمە؛ با

**letter** (let′ẽr), *n.* (١) تیپ؛ پیت (٢) نامە؛ پەیام؛ نووسراو.

(٣) (*pl.*) ویژە: *( a man of ~s)* .

(٤) واتای دەقاودەق.

(٥) (ا) تیپی چاپەمەنی.

(ب) شێوەیەکی تایبەتی ئەم تیپە یا تیپانە.

*v.t.* (١) لەسەر نووسین بە دەست.

(٢) نیشانەکردن بە تیپ؛ تیپ لەسەر نەخشکردن.

**letters,** (١) ویژە. (٢) زانیاری (بەتایبەتی هی ویژە)؛ زانین.

(٣) پیشەی نووسەر

**to the letter,** دەقاودەق؛ بەتەواوی؛ کت ومت؛ بێ زیادوکەمی:

*( to carry out an order to the letter)*

**letter box,** = mailbox.

**letter carrier,** = mailman.

**lettered** (let′ẽrd), *adj.* (١) خوێندەوار.

(٢) تێگەیشتوو؛ زانا؛ ڕۆشنبیر.

(٣) بە نووسین دیاریکراو.

**lettergram** (let′ẽr-gram′), *n.* بروسکەنامە؛ بروسکە.

**letterhead** (let′ẽr-hed′), *n.* (١) کاغەزی سپی دەزگایەکە ناوو ناونیشانی دەزگاکەی لەسەرە. (٢) ئەم ناوو ناونیشانە.

**letter of credit,** بڕوانامەی پشتیوانی دارایی (کە بانقێك دەیدات بە مەعمیلێکی بۆ قەرز وەرگرتن بە ناوی ئەو بانقەوە).

**letter of recommendation,** پەسەندنامە

**letter-perfect** (let′ẽr-pûr′fikt), *adj.* (١) تەواو؛ دەقاودەق؛ بێ هەڵە. (٢) دێڕەکانی خۆی لەبەرەو دەورەکەی خۆی باش دەزانێ (نوواندەن).

**letters ( or letter ) of credence,** بڕوانامەی باڵیۆز یا نوێنەری دبلۆماسی.

**letters ( or letter ) of marque ( and reprisal),** بڕوا-نامەیەکە کە میری دەیدات بە کەشتییەوانێك بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەشتی و شتومەکی وڵاتی دوژمن.

**letters patent,** بڕوانامەی مافێکی تایبەتی بەخشراو بە کەسێك لەلایەن میرییەوە

**letter testamentary,** بەڵگەنامەیەکە دادگا دەیدات بە سەروەسیەت بۆ جێبەجێکردنی وەسیەتنامە.

**lettuce** (let′is), *n.* کاهوو.

**let-up** (let′up′), *n.* [Colloq.], (١) کەم بوونەوە؛ هێواش بوونەوە؛ کزبوون: *( There was no ~ in the rain.)* .

(٢) وەستان؛ نەمان؛ دوایی هاتن.

**leuco-; leuc-; leuk-; leuko-** (lo͞o′kō, lū′kə), پێشگرێکە بەمانای: سپی (پزیشکەوانی)؛ بێ ڕەنگ.

**leucocyte** (lo͞o′kə-sīt′, lū′kə-sīt′), *n.* = leukocyte.

**leucoma** (lo͞o-kō′mə, lyoo-kō′mə), *n.* زۆر سپێتی و ناڕۆشنی کۆرنیای چاو (پزیشکەوانی).

**leuk-; leuko-,** = leuco- .

**leukemia, leukaemia** (lo͞o-kē′mi-ə), *n.* لوکیمیا: شێرپەنجەی خوێن.

**leukocyte** (lo͞o′kə-sīt′, lū′kə-sīt′), *n.* خڕۆکەی سپی خوێن.

**leukopenia** (lo͞o′kə-pē′ni-ə, lū′kə-pē′ni-ə), *n.* کەمی خڕۆکە سپییەکان لە خوێندا.

-leukopenic *(adj.)*.

**leukopoiesis,** پێکهاتن و پەرەسەندنی خڕۆکە سپییەکانی خوێن.

**Levant** (lə-vant′), *n.* (١) ناوچەی ڕۆژهەڵات؛ وڵاتانی ڕۆژهەڵات.

(٢) [l.]، جۆرە چەرمێکە.

**levanter** (lə-van′tẽr), *n.* (١) ڕۆژهەڵاتی؛ کەسێکی ڕۆژهەڵاتی.

(٢) بایەکی ڕۆژهەڵاتی بەهێزە.

**levantine** (lə-van′tin, lev′ən-tēn′), *adj.* ڕۆژهەڵاتی.

*n.* (١) ڕۆژهەڵاتی؛ کەسێکی ڕۆژهەڵاتی. (٢) کەشتییەکی ڕۆژهەڵاتی.

(٣) [l.]، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمە.

**levator** (lə-vā′tẽr), *n.* (١) ماسولکەی پەل یا ئەندامی تر بەرزکەرەوە.

(٢) ئامێرێکی پزیشکەوانییە بۆ بەرزکردنەوەی بەشی نەویوی کاسەسەری شکاو.

**levee** (lev′i), *n.* (١) بەستەکی قەراغ ڕووبار (بۆ لافاو ڕاگرتن).

(٢) بەستووی گۆڵە مەرەزە یا شتی وەها؛ بەستوویەکی لەسەر دێراو بەرزتر

(٣) شۆستەی قەراغ ڕووبار.

**levee** (lev′i, lə-vē′), *n.* (١) پێشوازی سەر لە بەیانی لەلایەن پادشا یا کەسێکی پایە بەرزەوە. (٢) پێشوازییەکی پاش نیوەڕۆیەکی زوو لە کۆشکی پادشای ئینگلیزدا تەنها بۆ پیاوان. (٣) پێشوازییەکی ڕەسمی.

**level** (lev′'l), *n.* (١) تەرازووی وەستای خانوو؛ تەرازووی خانووسازو دارتاش. (٢) پێوانی پلەی بەرزو نزمی بەم تەرازووە.

(٣) ئاست؛ ڕادە: *( sea ~ )* .

(٤) تەختایی؛ تەختانی.

(٥) ڕێکی؛ ئاست: *( The tops of the pictures should be on a ~ .)* .

(٦) بەرزایی؛ بەرزی.

(٧) پلە: *( Few men can rise to that ~ .)* .

*adj.* (١) تەخت. (٢) ڕێك؛ ئاستی یەکتر.

(٣) پڕ بەڵام لیپاولیپ نا؛ لە ڕێکی لێواری دەفرەکە: *( a ~ teaspoonful)*

(٤) هاوپلە. (٥) بەرامبەر؛ هاوتا.

*adv.* بە ڕێکی؛ بە تەختی.

*v.t.* (١) ڕێك کردن (بە تەرازووی خانووساز یا دارتاش)؛ یەك ئاست کردن

(٢) تەختکردن. (٣) هاوپلەکردن. (٤) وەك یەك لێکردن.

(٥) ڕووخاندن؛ تەختکردن (خانوو):

*( The storm ~ed trees and houses.)*

(٦) تفەنگ بەرزکردنەوەو ڕێك کردن بۆ تەقاندن.

(٧) نیشان گرتنەوە.

*v.i.* (١) نیشان گرتنەوە. (٢) نیشانەکردن؛ کردن بە نیشان.

(٣) وەك یەك لێکردن؛ یەك ئاست کردن.

(٤) ( ~ with )، [Slang]، ڕاستی پێ ووتن.

**level off,** ڕێك کردن؛ هاوڕێك کردن؛ تەختکردن.

**level with,** [Slang], ڕاستگۆو سەرڕاست بوون لەگەڵدا؛

ڕاستی پێ ووتن: *( You should level with me.)* .
**one's level best,** [Colloq.], ئەوەی کە لە توانادا بێ؛
بەوپەڕی تواناوە هەوڵدان: *( I will do my level best.)* .
**on the level,** [Slang], ڕاستگۆ؛ سەرڕاست؛ پاك؛ بێ فڕوفێڵ:
*( You are not on the level with them.)*
**leveler, leveller** (lev′'l-ẽr), *n.* (١) تەختکەر؛ ڕێککەر؛
وەك یەك لێکەر. (٢) یەکسانیخواز؛ یەکسانی پەروەر.
**level-headed** (lev′'l-hed′id), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ ژیر.
**leveling rod,** میلی زەوی پێو (بۆ پێوانی بەرزیو نزمی زەوی).
(هەروەها پێشی دەووترێ: **leveling staff, leveling pole** ).
**lever** (lev′ẽr, lē′vẽr), *n.* (١) نوێل: ئامێری بەرزکردنەوە.
(٢) میل: میلە تەرازوو. (٣) هۆی زەبر خستنەسەر.
***v.t.*** (١) بەرزکردنەوە (وەك بە نوێل). (٢) بەکارهێنان بۆ زەبر خستنەسەر.
***v.i.*** بۆ زەبر بەکارهێنان.
**leverage** (lev′ẽr-ij, lē′vẽr-ij), *n.* (١) بەرزکردنەوە بە نوێل؛
نوێلکاری (٢) دەست تێ خونجان
(٣) هۆی زەبر؛ هۆی کارتێکردن؛ دەست؛ دەسەلات:
*( to gain political and economic ~ ;*
*to have ~ over somebody).*
**leveret** (lev′ẽr-it), *n.* کەروێشکی یەك ساڵانە.
**leviable** (lev′i-ə-b'l), *adj.* (١) لەسەری دادەنرێ (باج)؛
کۆ دەکرێتەوە پاش لەسەر دانانی (باج). (٢) بۆی هەیە باجی لەسەر دانرێت.
**leviathan** (lə-vī′ə-thən), *n.* (١) دەعبەیەکی دەریایی گەورەیە
(ئینجیل). (٢) گیاندارێکی زۆر زل. (٣) شتێکی زۆر زلو قەبە.
**levigate** (lev′ə-gāt′), *v.t.* (١) هاڕین بە تەڕی؛ وەك ئارد لێکردن.
(٢) تێکەڵاوکردنو گرتنەوە (شلەك). (٣) سافو لووس کردن.
**levitate** (lev′ə-tāt′), *v.t.* بەرزکردنەوە بە هەوادا لەبەر سووکی.
***v.i.*** بەرزبوونەوە لە هەوادا لەبەر سووکی؛ لە هەوادا مەلەکردن؛
پێ لە زەوی بڕان.
**-levitation** *(n.)*; **levitator** *(n.)*.
**levity** (lev′ə-ti), *n.* (١) گاڵتەڕپێکەنین؛ گاڵتەوگەپ.
(٢) سووکی. (٣) هەمیشە گۆڕان؛ حولحولێتی.
**levorotation** (lē′və-rō-tā′shən), *n.* خولانەوە لە ڕاستەوە بۆ
چەپ
**levulose** (lev′yoo-lōs′), *n.* = **fructose.**
**levy** (lev′i), *n.* (١) باج لەسەر دانانو کۆکردنەوە؛ باج گرتن
(٢) باج؛ سەرانە؛ میرانە. (٣) سەرباز گرتن.
(٤) ئۆردووی وەها گیراو؛ کۆمەڵە سەربازی گیراو.
***v.t.*** (١) باج لەسەر دانان؛ باج گرتن؛ باج لێگرتن.
(٢) گرتن بە سەرباز. (٣) بەرپاکردن (شەڕ)؛ جەنگان؛ کردن؛ پێ هەڵسان.
***v.i.*** دەستبەسەرداگرتنی زەویوزار (لەلایەن دادگاوە).
**lewd** (lōōd, lūd), *adj.* (١) بەرەڵا: بێ شەرم؛ سووك؛ هەڵماڵراو؛
ئاڵۆش تێخەر؛ هەوەس هەڵسێنەر: *( ~ behavior, remarks, etc.)* .
(٢) [Obs.]، (ا) بەدخواز؛ ناپەسەند؛ پیسو بۆگەن؛ نزم؛ ناڕەسەن.
(ب) نەزان
**-lewdly** *(adv.)*; **lewdness** *(n.)*.
**lexical** (lek′si-k'l), *adj.* (١) ووشەیی؛ زاراوەیی؛ زمانی.
(٢) فەرهەنگی
**lexicographer** (lek′sə-kog′rə-fẽr), *n.* فەرهەنگ دانەر؛
فەرهەنگ نووس
**lexicography** (lek′sə-kog′rə-fi), *n.* فەرهەنگ دانان؛
فەرهەنگ نووسین.
**-lexicographic; lexicographical** *(adj.)*.
**lexicology** (lek′si-kôl′ə-ji), *n.* ووشەناسی (زمانەوانی)؛
زانستی لێکۆڵینەوەی ووشە.

**lexicon** (lek′si-kən), *n.* (١) فەرهەنگ؛ فەرهەنگی زمانێکی کۆن.
(٢) ووشەو زاراوەی تایبەتی بە نووسەرێك، کەسێك، یا پیشەیەك:
*( the ~ of the sports page)*
**liability** (lī′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) بەرپرسی؛ بەرپرسیاری؛ ئەستۆ؛ ئەرك؛
ئۆباڵ. (٢) (*pl.*) قەرز.
(٣) کۆسپ؛ بار (مەجاز)؛ مایەی زیان:
*( He is not an asset but a ~ to our team.)*
(٤) بۆهەبوون؛ لەوانەبوون.
**liable** (lī′ə-b'l), *adj.* (١) بەرپرس؛ لێپرسراوە لە ڕووی یاساوە:
*( If you cause an accident, you are ~ for all the damages.;*
*A man is ~ for his wife's debts.)*
*( You're ~ to get sick.;* (٢) لەوانەیە؛ بۆی هەیە؛ دەشێ:
*All men are ~ to make mistakes.)*
**liaison** (lē′ā-zōn′), *n.* (١) پەیوەندی؛ یەکخستنو ڕێکخستنی کاروبار
(بەتایبەتی لەنێوان لقو بەشەکانی لەشکردا).
(٢) پەیوەندیکار؛ هۆی پەیوەندی. (٣) دڵداری نهێنی.
(٤) لێکدانی ووشە لە گفتوگۆی فەرەنسیدا (بە بێژانی دوا تیپی بە ئاسایی
نەبێژراوی ووشەیەك ئەگەر دوا بە دوای ووشەیەك هاتبێ دەستی بە تیپە
بزوێن کردبێت. وەك: " **chez elle** " کە دەخوێنرێتەوە " شەزێل " ).
**liaison officer,** ئەفسەری پەیوەندیکار؛ ئەفسەری پەیوەندی.
**liar** (lī′ẽr), *n.* درۆزن؛ درۆکەر.
**libation** (lī-bā′shən), *n.* (١) شەراب یا ڕۆن ڕشتن بە زەویدا یا کردن
بەسەر لەشی قوربانیدا بۆ خودایەك (نەریتی یۆنانییە). (٢) ئەم شەراب یا ڕۆنە.
(٣) خواردنەوەی کحول (لە ڕووی گاڵتەوە)؛ مەی.
**libel** (lī′b'l), *n.* (١) ناو پیس کردن (بە نووسین، وێنە... هتد)؛ ناوزڕاندن؛
بەدناوکردن؛ بەدوێژی کردن (٢) بڵاوکردنەوەی بەدوێژی یا ناو پیس کردنێك
(٣) سکاڵانامە (یاسای ئاینیو دەریایی).
**libelant, libellant** (lī′b'l-ənt), *n.* سکاڵاکەر (یاسای ئاینیو
دەریایی).
**libelee, libellee** (lī′b'l-ē′), *n.* شکات لێکراو (لە داواکارییەکی
ناوزڕاندندا).
**libelous, libellous** (lī′b'l-əs), *adj.* ناوزڕێن؛ ناوپیسکەر؛
بەدناوکەر؛ ناوزڕاندنی تێدایە: *( a ~ article, statement, etc.)* .
**liberal** (lib′ẽr-əl, lib′rəl), *adj.* (١) ئازاد؛ بۆ پیاوی ئازاد شیاو:
*( ~ arts, a ~ education)*
(٢) بەخشندە؛ بدە؛ بەرچاوتێر: *( a ~ giver)* .
(٣) فرە؛ زۆر؛ مشە: *( a ~ reward)* .
(٤) نادەقاودەق: خۆ نەبەستنەوە بە دەقەوە؛ بێ سنوور؛ کراوە:
*( a ~ interpretation of the law)*
(٥) مێشك کراوە؛ مێشك فراوان.
(٦) دیموکراتی. (٧) ئازادیخوا.
(٨) [L-]، حیزبی ئازادیخوا.
(٩) [Obs.]، بەرەڵا (ڕەووشت)؛ ناشرین.
***n.*** (١) ئازادیخوا؛ کەسێکی ئازادیخوا.
(٢) [L-]، ئەندامی حیزبێکی ئازادیخوای ئەوروپایی.
-liberally *(adv.)*; **liberalness** *(n.)*.
**liberal arts,** زانستە ئەدەبییەکان وەك: ڕێزەو مێژوو فەلسەفە:
*( a ~ college)*
**liberalism** (lib′ẽr-əl-iz'm, lib′rəl-iz'm), *n.* (١) ئازادیخوایی.
(٢) بیروباوەڕو فەلسەفەی ئازادیخوازی.
**liberalist** (lib′ẽr-əl-ist, lib′rəl-ist), *adj.* ئازادیخوا.
***n.*** کەسێکی ئازادیخوا؛ ئازادیخوا.
-liberalistic *(adj.)*.
**liberality** (lib′ə-ral′ə-ti), *n.* (١) بەخشندەیی؛ بدەیی؛ بەرچاوتێری.
(٢) خەڵات؛ بەخش. (٣) مێشك فراوانی؛ مێشك کراوەیی.

**liberalize** (lib′ēr-ə-līz′, lib′rə-līz′), *v.t.* جلەو شل کردن؛
چاوپۆشین؛ لێبووردن؛ زیاتر ڕێ پێدان: ***( to ~ drinking laws)*** .
*v.i.* جلەو شل کردن؛ چاو لێ پۆشران.
-liberalization *(n.)*.
**liberate** (lib′ə-rāt′), *v.t.* (١) ئازادکردن؛ ڕزگارکردن:
***( to ~ a people, country, etc.)***
(٢) لێك جیاکردنەوە (بەشەکانی ئاوێتەی کیمیا).
(٣) [Military Slang]، تالانکردن؛ دزین.
-liberator *(n.)*.
**liberation** (lib′ə-rā′shən), *n.* (١) ئازادکردن؛ ڕزگارکردن؛
سەربەستکردن. (٢) ئازادی؛ ڕزگاری.
**libertarian** (lib′ēr-târ′i-ən), *n.* (١) لایەنگری بیروباوەڕی
سەربەستی ویستن و کردن (کە دەڵێت: مرۆڤ سەربەستە لە خواست و کرداریدا و
نەبەستراوەتەوە بە هیچ شتێکی لە خۆ بەدەر).
(٢) ئازادیخوا؛ لایەنگری ئازادی بیرکردنەوە و کارکردنی مرۆڤ؛ ئازادی پەروەر.
*adj.* لایەنگری یەکێك لەم دوو بیروڕایەی خانی یەك و دوو
-libertarianism *(n.)*.
**libertinage** (lib′ēr-tin-ij), *n.* = **libertinism.**
**libertine** (lib′ēr-tēn′, lib′ēr-tin), *n.* (١) بەندێکی ڕۆمانی
ئازادکراو (٢) کەسێکی داوێن پیس؛ سەرسەری؛ بەرەڵا.
(٣) پەیڕەوی نەکەری هیچ جۆرە بیروباوەڕێکی ئاینی و ڕەوشتی؛ بێ بڕوا.
*adj.* سەرسەری؛ داوێن پیس؛ بەرەڵا
**libertinism** (lib′ēr-tin-iz'm), *n. Also* **libertinage**, داوێن
پیسی؛ داوێن پیسێتی؛ سەرسەرێتی؛ بەرەڵایی.
**liberty** (lib′ēr-ti), *n.* (١) ئازادی؛ سەربەستی؛ ڕزگاری.
(٢) سەرجەمی جۆرە مافێك: ***( civil ~ies)*** .
(٣) ڕێ پێدان؛ ماف؛ مافێکی تایبەتی.
(٤) ڕووکرانەوەی نابەجێ؛ شەرم شکانی بێ ئەندازە: ***( to take ~ies)*** .
(٥) (ا) پشووی سەربازی هێزی دەریایی.
(ب) ماوەی ئەم پشووە (بۆ چوونە ناوشار).
(٦) سەربەستی هەڵبژاردن (فەلسەفە).
**at liberty,** (١) ئازاد؛ سەربەست؛ بەرەڵا.
(٢) ڕێ دراو (بۆ کردن یا ووتنی شتێك)؛ بۆی هەیە:
***( You are at liberty to come or go.)***
(٣) دەستبەتاڵ؛ بێ ئیش.
**take liberties,** (١) زۆر بە ڕووکراوانە ڕەووشت نواندن؛
بە شەرم شکاوانەی بێ ئەندازە لەگەڵ جووڵانەوە؛
بە ناشرینانە لەگەڵ جووڵانەوە
***( to take liberties with somebody; to take liberties)***
(٢) زۆر گوێ پێ نەدان (پەیڕەو)؛ بە هەوەسی خۆ جووڵانەوە؛
لە تام کردنە دەرەوە
**libidinous** (li-bid′'n-əs), *adj.* بە جۆش و خرۆش؛ بە هەوەس؛
بە ئالۆش
**libido** (li-bī′dō, li-bē′dō), *n.* (١) (ا) ئارەزووی جووت بوون؛
هەستی جووت بوون؛ ووزەی جووت بوون؛ ئالۆش.
(ب) نیشانەی ئەم ئالۆش و ئارەزووە.
(٢) هەست و ووزەی زگماکی هاندەر بۆ هەموو کردەوەیەکی مرۆڤ.
**Libra** (lī′brə), *n.* بورجی تەرازوو (ئەستێرەوانی).
**libra** (lī′brə), *n.* (١) پاوەند: سەنگێکە نەختێك لە نیو کیلۆ کەمترە.
(٢) سەنگێکی ڕۆمانی کۆنە لە پاوەند کەمترە.
**librarian** (lī-brâr′i-ən), *n.* (١) بەڕێوەبەری کتێبخانە؛
لێپرسراو یا بەڕێوەبەری پەرتووکخانە (٢) فەرمانبەری کتێبخانە.
**library** (lī′brer′i, lī′brə-ri), *n.* (١) (ا) کتێبخانە؛ پەرتووکخانەی
گشتی (ب) کتێبخانەی تایبەتی کەسێك.
(٢) کۆمەڵێك پەرتووکی سەرچاوەیی کتێبخانەیەك.
(٣) دەستە پەرتووکی بلاوکراوە لەلایەن چاپخانەیەکەوە.
**librate** (lī′brāt), *v.t.* (١) لەرینەوە؛ جۆلانێ کردن؛ ڕاڕاکردن.
(٢) بە هاوتەرازوویی مانەوە.
-libration *(n.)*.
**libretto** (li-bret′ō), *n.* (١) دەق یا ووشەکانی ئۆپەرا.
(٢) پەرتووکی دەقی ئۆپەرا.
**lice** (līs), *plural of* **louse.**
**license** (lī′s'ns), *n.* (١) ڕێ پێدان؛ ڕێ دانێکی ڕەسمی بۆ کردنی شتێك:
***( a ~ to marry, hunt, drive a car)***
(٢) بڕوانامەی ئەم ڕێ پێدانە: ***( a driver ~ )*** .
(٣) (ا) سەربەستی لادان لە دەستوور یا نەریتی باو: ***( Poetic ~ )*** .
(ب) نموونەیەکی ئەم لادانە.
(٤) بەرەڵایی؛ بەکارهێنانی سەربەستییەك یا مافێك بە شێوەیەکی نابەجێ.
(٥) سەرسەرێتی؛ بێ پەردەیی؛ بێ ئابڕوویی؛ بەرەڵایی؛ داوێن پیسی.
*v.t.* ڕێ پێدان؛ ماوەپێدانی ڕەسمی؛ بڕوانامە پێدان.
-licenser; licensor *(n.)*.
**licensee** (lī′s'n-sē′), *n.* ڕێ پێدراو بە ڕەسمی؛ ماوە پێدراو.
**licentiate** (lī-sen′shi-it, lī-sen′shi-āt′), *n.* (١) بڕوانامە پێدراو
بۆ پیشەکارییەك. (٢) لیسانس: بڕوانامەیەکی زانکۆی ئەوروپاییە لەنێوان
بەکالۆریۆس و دکتۆرادا.
**licentious** (lī-sen′shəs), *adj.* (١) بەرەڵا؛ داوێن پیس؛ سەرسەری؛
بێ ئابڕوو؛ کەیف پەرست.
(٢) [Arch.]، گوێ بە پەیڕەو و نەریت و دەستووری کۆن نەدەر.
-licentiously *(adv.)*; licentiousness *(n.)*.
**lichen** (lī′kən), *n.* (١) قەوزە. (٢) نەخۆشییەکی پێستە.
**lichenology** (lī′kən-ol′ə-ji), *n.* قەوزەناسی؛ زانستی قەوزە.
**lich gate,** *Also* **lych gate,** ڕاڕەوی سەرگیراوی بەردەمی حەوشەی
کڵێسەیە تەرمی مردووی تێدا دادەنرا تا گەیشتنی قەشە.
**licit** (lis′it), *adj.* درووست؛ یاسایی؛ ڕێ پێ دراو بەپێی یاسا؛ حەڵاڵ.
**lick** (lik), *v.t.* (١) لستنەوە؛ لێسانەوە.
(٢) بە ئاستەم بەرکەوتن (شەپۆل، گڕ)؛ پێداهێنان؛ لێخشاندن.
(٣) (ا) [Colloq.]، بێزارکردن؛ دارکاری کردن؛ تێهەڵدان؛ بە قەمچی لێدان.
(ب) بەسەردا زاڵبوون (مرۆڤ، شت)؛ بەزاندن:
***( to ~ a disease, problem, person, etc.)***
*v.i.* بە خشپە و بە تیژی بزوان.
*n.* (١) لستنەوە؛ لێسانەوە. (٢) نەختێك؛ تۆزێك؛ نەختاڵ.
(٣) کارێکی پەلە و لامسەرلایی (خۆشتن، شوێن پاککردنەوە).
(٤) شوێنێکە (وەك کانیاوێك) کە گیاندار زوو زوو بۆی دەچن بۆ لستنەوەی
بەردی سوێری دەوروپشتەکەی.
(٥) [Colloq.]، دارکاری. (٦) [Slang]، هەل؛ نۆبە.
**lick one's lips,** زۆر پێ خۆش بوون؛ مرخ لێ خۆش کردن.
**lick one's wounds,** سەری خۆ کزکردن پاش بەزین.
**lick the dust,** بەزین؛ کوژران؛ تۆپین.
**lick up,** لستنەوە؛ پاککردنەوە بە لستنەوە؛ ماشینەوە.
**lickerish** (lik′ēr-ish), *adj.* (١) بە ئالۆش؛ بەرەڵا.
(٢) نەوسن؛ چڵێس؛ چاوبرسی.
**licking** (lik′iŋ), *n.* (١) لستنەوە؛ لێسانەوە.
(٢) بێزارکردن؛ کوتان؛ بە قەمچی لێدان.
**licorice** (lik′ēr-is, lik′ēr-ish), *n. Also* **liquorice,** (١) بەلەك.
(٢) ڕەگە بەلەك. (٣) نوقوڵە بەلەك.
**lid** (lid), *n.* (١) سەرقاپ؛ قەپاغ؛ سەرقەپاغ؛ سەر؛ سەردەم.
(٢) پێڵووی چاو. (٣) [Colloq.]، ڕاگرتن؛ سنوور؛ ڕێ نەدان:
***( The police put the ~ on vice.)***
(٤) [Slang]، کڵاو؛ تەپلە؛ شەپقە.
**lidless** (lid′lis), *adj.* (١) بێ سەرقاپ؛ بێ سەر؛ بێ قەپاغ.

(٢) ووریا؛ بێ خەو؛ نەنوستوو.

**lie** (lī), ***v.i.*** (١) پاڵکەوتن؛ ڕاکشان.

(٢) لە بارێکی تایبەتیدا بوون:

***( The town lay in ruins after the earthquake.)***

(٣) کەوتنە: دەکەوێتە:

***( Canada ~s to the north of United States.)***

(٤) درێژبوونەوە ***( The valley lay at our feet.)***.

(٥) بوون؛ لە شوێنێکدا یا شتێکدا بوون:

***( The remedy ~s within yourself.)***

(٦) نێژران؛ خرانە گۆڕەوە.

(٧) [Archaic]، لادان یا مانەوە لە شوێنێك (بۆ شەوێك یا زیاتر).

(٨) بەپێی یاسا پەیڕەو نییە (داواکاری لە دادگادا):

***( This appeal will not ~ .)***

***n.*** (١) شێوەی بوون یا ڕێکخران: ***( the ~ of the land)***.

(٢) لانە

**lie down,** پاڵکەوتن؛ ڕاکشان و حەوانەوە

**lie in,** لە جێدا مانەوە لەبەر منداڵبوون

**lie with,** [Archaic]، جووت بوون لەگەڵ؛ چوونە جێ لەگەڵ؛ گاین.

**take lying down,** [Colloq.]، خۆبەدەستەوەدان بە بێ بەرهەڵستی.

**lie** (lī), ***v.i.*** درۆکردن.

***v.t.*** بە درۆ بەدەستهێنان؛ بە درۆ کردن یا جێبەجێکردن

***n.*** درۆ ***( to tell a ~ . )***.

**lie in one's throat,** درۆیەکی زل یا ئاشکراکردن.

**lie out of,** خۆ پەڕاندنەوە لە تەنگوچەڵەمەیەك بە درۆکردن.

**white lie,** درۆی ڕەو.

**lied** (lēd), ***n.*** گۆرانییەکی ئەڵمانی.

**lie detector,** درۆ دۆزەرەوە: ئامێرێکە ئەگەر کەسێك بە درۆ وەڵامی پرسیارێك بداتەوە هەستی پێ دەکات (لە ڕێی تۆمارکردنی گۆڕانی لێدانی دڵ و دەنگ و کرژبوونەوە... هتد).

**lief** (lēf), ***adj.*** [Obs.], (١) خۆشەویست (٢) ئامادە؛ ئارەزووکەر.

***adv.***, [Rare], بە دڵ؛ ئامادە.

**liege** (lēj), ***adj.*** (١) مافی دەرەبەگایەتی هەیە؛ مافی ئەوەی هەیە مسکینەکانی دڵسۆزی بن و کاری بۆ بکەن.

(٢) بەستراوەتەوە بە پەیمانی دڵسۆزی و خزمەتکردنی دەرەبەگەکەی؛ بەندە؛ ڕەنجبەر ***( ~ subjects)***.

(٣) دڵسۆز؛ بەوەفا.

***n.*** (١) بەگ؛ سەروەر؛ پاشا؛ سەرگەورە؛ دەرەبەگ.

(٢) بەردەست؛ مسکین؛ ڕەنجبەر.

**liegeman** (lēj′mən), ***n.*** (١) مسکین؛ ڕەنجبەر.

(٢) بە دووکەوتوویەکی دڵسۆز؛ پاشکۆیەکی بەوەفا؛ لایەنگیر.

**lien** (lēn, lē′ən), ***n.*** بارمتە (زەوی‌وزار، خانوو، ئوتومبیل)؛ مافی دەستبەسەرداگرتن یا فرۆشتنی خانوویەك یا شتێك لەباتی قەرز (ئەگەر قەرزەکە نەدرێتەوە): ***( The bank has a ~ on my car.)***.

**lienal** (lē′n'l), ***adj.*** تایبەتی بە سپڵ؛ سپڵی

**lieu** (lōō, lū), ***n.*** جێ؛ جێگە

**in lieu of,** لەباتی؛ لەجیاتی؛ لە بریتی.

**lieutenancy** (lōō-ten′ən-si, lū-ten′ən-si), ***n.*** پلەوپایەی ئەفسەری یەك ئەستێرە " ملازم ".

**lieutentant** (lōō-ten′ənt, lū-ten′ənt), ***n.*** (١) جێگر؛ یاریدەدەر.

(٢) ئەفسەری یەك ئەستێرە یا دوو ئەستێرە.

**lieutentant colonel,** ئەفسەرێکە پلەیەك لە خوار (کۆلۆنێل)ەوەیە.

**lieutentant commander,** ئەفسەرێکی هێزی دەریاییە پلەیەك لەسەروو " ملازم " ەوەیە.

**lieutentant general,** جێگری جەنەڕاڵ؛ ئەفسەرێکە پلەیەك لە خوار (جەنەڕاڵ)ەوە

**lieutentant governor,** جێگری فەرمانڕەوای ویلایەتێکی ئەمەریکی.

**life** (līf), ***n.*** (١) ژیان. (٢) گیاندار (بەتایبەتی مرۆڤ).

(٣) زیندەوەر؛ توخمێکی تایبەتی زیندەوەر: ***( plant ~ )***.

(٤) باری ژیان: ***( His was a ~ of poverty.)***.

(٥) جۆری ژیانی پیشەیەکی تایبەتی و دەوروبەری: ***( military ~ )***.

(٦) ژیاننامە؛ ژیننامە

(٧) گیان.

(٨) گەوهەر؛ ناوکرۆك:

***( Freedom of speech is the ~ of democracy.)***

(٩) سەرچاوەی خۆشی و بەزم‌وڕەزم: ***( She was the ~ of the party.)***.

(١٠) زیندوویتی؛ چالاکی؛ گورج‌وگۆڵی.

**a matter of life and death,** (١) مەسەلەی مردن و ژیانە.

(٢) شتێکی زۆر گرنگ.

**bring to life,** (١) هێنانەوە هۆش خۆ؛ هۆش هێنانەوەبەر.

(٢) گەرم کردن (کۆڕ، ئاهەنگ)؛ خۆش کردن.

**come to life,** (١) هۆش هاتنەوەبەر؛ هاتنەوە هۆش خۆ.

(٢) گەرم بوون (کۆڕ، ئاهەنگ)؛ خۆش بوون.

**for life,** (١) بە درێژایی ژیان هەتا مردن: ***( a job for life)***.

(٢) بۆ ژیانی خۆ ڕزگارکردن یا پاراستن.

**not on your life,** [Colloq.], بە هیچ جۆرێ؛ نابێ.

**take life,** کوشتن.

**take one's own life,** خۆکوشتن.

**true to life,** ڕاستەقینە؛ ڕاست.

**life-blood** (līf′blud′), ***n.*** (١) خوێن.

(٢) گەوهەری شتێك؛ پێویستترین شت بۆ ژیان و مانەوە و بەردەوام بوونی شتێك.

**life-boat** (līf′bōt′), ***n.*** بەلەمی ڕزگاری؛ بەلەمی فریاکەوتن (کە کەشتی هەڵی دەگرێت بۆ تەنگانە، وەك جۆلکردنی کەشتییەکە)

**life buoy,** چاکەتی ڕزگاری لە خنکاندن؛ چاکەتی سەرئاوخەر.

**life cycle,** چەرخی ژیان.

**life expectancy,** ماوەی ژیانی مرۆڤی چەرخێك یا وڵاتێك بە تێکرایی؛ تێکرای درێژی ژیانی مرۆڤ

**life-giving** (līf′giv′iŋ), ***adj.*** (١) ژیانبەخش؛ زیندووکەرەوە

(٢) خۆش؛ بەهێزکەر؛ تازەکەرەوە.

**life-guard** (līf′gärd′), ***n.*** پاسەوانی مەلە؛ لە خنکان ڕزگارکەر (لە دەوری گۆمی مەلە و کەناری دەریا).

**life history,** مێژووی ژیان (لە لەدایکبوونەوە تا مردن).

**life insurance,** بیمەی ژیان.

**life jacket,** چاکەتی ڕزگاری لە خنکان؛ چاکەتی سەرئاوخەر.

**lifeless** (līf′lis), ***adj.*** (١) (ا) مردوو. (ب) بێ گیان.

(٢) ووشك و ناخۆش؛ بێ ووزە؛ سست؛ خاو.

**life-like** (līf′līk′), ***adj.*** (١) زیندوو؛ لە زیندوو چوو؛ لە خۆ چوو:

***( a ~ portrait)***

(٢) ڕاستەقینە؛ ڕاست.

**life line,** (١) پەتی ڕزگاری: (ا) کە لە کەناری دەریاوە فڕێ دەدرێ بۆ کەشتییەك کە لە تەنگانەدایە. (ب) کە کەسێکی پێ ڕزگار دەکرێت لە خنکاندن

(٢) پەتی بەرزکردنەوە و نزم کردنەوەی مەلەوانی ژێر ئاو.

(٣) هێڵێکی ناو لەپە (کە گوایە ڕاستی ژیانی ئەو کەسە دەردەخات)

(٤) ڕێگەیەکی دەریایی بازرگانی زۆر گرنگ.

(٥) ڕێی ئازووقە لێوە ناردن.

**life-long** (līf′lôŋ′), ***adj.*** بە درێژایی ژیان: ***( a ~ friendship)***.

**life preserver,** (١) چاکەتی ڕزگاری لە خنکان؛ چاکەتی سەرئاوخەر.

(٢) کوتەك؛ داردەست (بۆ خۆ پاراستن).

**lifer** (līf′ēr), ***n.*** [Slang], بەندێکی هەتا مردن.

**life raft,** کەڵەکی ڕزگارکەر.

**life-saver** (līf′sāv ĕr), *n.* (١) لە خنكان ڕزگاركەر (مرۆڤ، بەلەم، شت).
(٢) پاسەوانى مەلە. (٣) [Colloq.]، كەسێك يا شتێكى زۆر پێويستو گرنگ بۆ ئاسوودەيىو ژيان.
**life-saving** (līf′sāv′iŋ), *adj.* مرۆڤ ڕزگاركەر لە خنكاندنو مردن:
*( a ~ device)*
*n.* مرۆڤ ڕزگاركردن لە خنكاندنو مردن.
**life-size** (līf′sīz′), *adj.* بە قەبارەى خۆ (وێنە، پەيكەر):
*( a ~ portrait)*
**life-sized** (līf′sīzd′), *adj.*, = life-size.
**life-style** (līf′stīl′), *n. Also* life style, شێوەى ژيان (مرۆڤ، چين، كۆمەل).
**life-time** (līf′tīm′), *n.* (١) ژيان؛ ماوەى ژيان.
(٢) ماوەى كاركردن، بەردەوام بوون، يا بوونى شتێك
*adj.* بە درێژايى ژيان: *( a ~ job)* .
**life-work** (līf′wûrk′), *n.* گرنگترين كارى ژيان؛
ئەركو كارێكە كە كەسێك خەريكيتى بە درێژايى ژيانى.
**lift** (lift), *v.t.* (١) بەرزكردنەوە؛ هەلبرين؛ هەلگرتن.
(٢) پلەوپايە بەرزكردنەوە؛ بلندكردنەوە (هەست، بارى ژيان؛ وورە ئانەبەر؛ هيوا پێدان *( to ~ the nation's spirits.)* .
(٣) دانەوەى قەرزى سەر بارمتەيەكو بەتال كردنەوەى.
(٤) دەموچاوهەلگرتن؛ چرچولۆچى دەموچاوو غەبغەبە لابردن (پزيشكەوانى).
(٥) [Colloq.]، قۆپيەكردن؛ دزينو بە هى خۆ دانان (نووسراو):
*( He ~ed a passage from Shakespeare.)*
(٦) [Slang]، دزين.
(٧) نەمام هەلكەندن بۆ گواستنەوەو ناشتنى.
(٨) لابردن (ئابلووقە): *( to ~ blockade, curfew, etc.)*
*v.i.* (١) بە گران يا بە زەحمەت) شت بەرزكردنەوە.
(٢) لاچوون؛ نەمان؛ ڕەوينەوە:
*( By afternoon, the clouds had ~ed.)*
(٣) بەرزبوونەوە.
(٤) وەستان.
*n.* (١) بەرزبوونەوە؛ بلندبوونەوە. (٢) بار؛ ئەوەندەى بە جارێك هەلدەگيرێت.
(٣) ماوەى بەرزكردنەوە
(٤) هێزى بەرزكردنەوە: *( the ~ of the pump)*
(٥) وورە؛ پال؛ هيوا؛ هاندان: *( to give a hopeless person a ~ .)* .
(٦) گەياندن (بە ئوتومبيل بەرەو ئەو شوێنەى كەسەكە خۆى بۆى دەچێت):
*( She gave me a ~ to my office.)*
(٧) بەرزايى. (٨) چينێكى پاژنە پێلاو
(٩) يارمەتى؛ ياريدە
(١٠) (ا) [British]، بەرزكەرەوەى كارەبايى ناو خانوو (لە ئەمەريكا پێى دەووترێ: " elevator ").
(ب) بەرزكەرەوەى كارەبايى بۆ شوێنى بەفرەخليسكێ لەسەر شاخو گردەكان.
(١١) هێزى بەرزبوونەوە (فرۆكەوانى).
**lift-off** (lift′ôf′), *n.* فرين؛ هەلسان؛ لە زەوى برانو بەرزبوونەوەى كەشتى ئاسمانىو مووشەك.
**ligament** (lig′ə-mənt), *n.* (١) بەند؛ پەيوەند؛ پێبەست.
(٢) چەند ڕيشالێكى جيڕن ئێسكەكان بەيەكەوە دەبەستنەوە بەتايبەتى هى جومگەكان؛ ئەم جۆرە ڕيشالەيە ئەندامى لەش لە جێى خۆيدا ڕادەگرێ.
**-ligamental; ligamentary; ligamentous** *(adj.)*.
**ligate** (lī′gāt), *v.t.* بەستنەوەى دەمارى خوێن (نەشتەركارى).
**ligation** (lī-gā′shən), *n.* (١) بەستنەوەى دەمارى خوێن.
(٢) سارغى؛ تەل نەشتەركارى؛ پێبەست؛ بەند.
**ligature** (lig′ə-chĕr), *n.* (١) پێكەوەبەستنەوە؛ پێچانەوە
(٢) پێبەست؛ سارغى.
(٣) تەل پێكەوەبەستن (نەشتەركارى).

(٤) دوو نۆتەى پێكەوەلێدراو (مۆسيقا).
(٥) تيپە دووانە؛ جووتە تيپ: دوو تيپن كە پێكەوە دەنووسرێنو دەخوێنرێنەوە (وەك: æ ).
*v.t.* پێكەوەبەستنەوە.
**light** (līt), *n.* (١) ڕووناكى؛ ڕۆشنايى. (٢) شەوق.
(٣) سەرچاوەى ڕووناكى (خۆر، چرا، لەمپا).
(٤) تيشكى ڕۆژ؛ ڕووناكى خۆر (٥) بەرەبەيان؛ ڕۆژبوونەوە.
(٦) ماوەى ڕووناكى ڕۆژگار. (٧) پەنجەرە؛ كونى ڕووناكى.
(٨) شقارتە؛ چەرخ؛ ئاگر. (٩) ڕۆشنبيرى؛ تێگەيشتوويى.
(١٠) ئاشكرايى؛ هاتنەڕوو؛ دەركەوتن:
*( Every day new facts are brought to ~ .)*
(١١) شێوەى هاتنە بەرچاو؛ ڕوالەت؛ شێوەى بينين:
*( She saw the situation in a different ~ .)*
(١٢) [Archaic & Poetic]، بينايى؛ بينين.
(١٣) *(pl.)* بيروبڕواو هەلوێستو شێوەى بيركردنەوەى خۆ.
(١٤) ڕووناكى ژيان؛ مايەى خۆشىو شادى:
*( His daughter is the ~ of his life.)*
(١٥) نموونە؛ كەسێكى بەناوبانگ كە دەبێتە نموونەى باش بۆ خەلك
(١٦) چاوكەشانەوە؛ چاوكەشى.
*adj.* (١) ڕووناك؛ ڕۆشن؛ گەش.
(٢) كراوە (ڕەنگ)؛ سپى؛ سپيكار؛ كال: *( ~ colors)* .
*adv.* كال؛ كراوە (ڕەنگ).
*v.t.* (١) داگيرسان؛ كردنەوە (ئاگر)؛ هەلگيرسان:
*( to ~ a candle, fire, lamp, etc.)*
(٢) ڕووناك كردنەوە: *( Lamps ~ the streets.)* .
(٣) خۆشىو ڕووناكى تێخستن؛ ژياندنەوە: *( A smile ~s his face.)*
(٤) ڕێ بۆ ڕووناك كردنەوە؛ ڕێ پيشاندان.
*v.i.* (١) ئاگرگرتن؛ سووتان: *( Green wood will not ~ easily.)* .
(٢) ( **~ up** ) ڕووناك بوونەوە؛ ڕۆشن بوونەوە؛ ڕوون بوونەوە.
**bring to light,** دەرخستن؛ ئاشكراكردن؛ پيشاندان؛ خستنەڕوو.
**come to light,** ئاشكرابوون؛ دەركەوتن؛ هاتنەڕوو.
**in the light of,** لەبەر؛ لە ڕەچاوكردنى ئەم شتەدا؛ بەپێى؛ بەهۆى؛ لە ئەنجامى ئەمەدا:
*( In the light of these facts we cannot sign any agreement.)*
**light up,** (١) ڕووناك بوونەوە؛ ڕۆشن بوونەوە؛ ڕوون بوونەوە.
(٢) دلخۆش كردن؛ خۆشحال كردن؛ ڕوونكردنەوە (ژيان):
*( to light up someone's life)*
(٣) [Colloq.]، جگەرە داگيرسان؛ جگەرە كێشان.
**see the light ( of day ),** (١) لەدايكبوون؛ ڕووناكى بينين؛ هاتنەدى.
(٢) ئاشكرابوون؛ دەركەوتن؛ هاتنەڕوو.
(٣) بۆ ڕوون بوونەوە؛ تێگەيشتن؛ چاوكرانەوە.
**shed ( or throw ) light on,** ڕوونكردنەوە (مەسەلە، باس).
**stand in one's own light,** زيان بە خۆ گەياندن.
**strike a light,** شقارتە داگيرسان؛ شقارتە لێدان.
**light** (līt), *adj.* (١) سووك؛ سووكەلە.
(٢) (ا) سووك: *( a ~ blow)* .
(ب) كەم: *( a ~ rain; a ~ vote )* .
(ج) ناسك؛ تەنك؛ جوانو ناسك. (د) كز؛ هێواش: *( a ~ wind)* .
(ه) نزم (دەنگ)؛ نەرم: *( a ~ sound)* .
(و) كەم؛ كز: *( ~ applause)* .
(٣) ئاگرنگ: *( ~ conversation)* .
(٤) ئاسان؛ كز؛ كەم: *( a ~ tax)* .
(٥) ئاسان: *( ~ work)* .
(٦) ڕووخۆش؛ باشبين؛ بەكەيف؛ سووك (گيان): *( ~ spirits; ~ hearted)* .
(٧) حولحولى؛ سووك؛ پاڕا؛ هيچوپووچ.

(۸) بەرەلا· بەدڕەووشت؛ داوێن پیس؛ بێ ئابڕوو.
(۹) گێژ؛ حوِل *(a ~ head)* .
(۱۰) سووک‌و ئاسان؛ خۆش: *(~ reading)* .
(۱۱) سووک؛ کحولی کەم تێدایە: *(~ wine)* .
(۱۲) (ا) کەم؛ بچووک؛ مام ناوەندی: *(a ~ meal)* .
(ب) بە ئاسانی پەلەخورد دەکرێ؛ سووک.
(ج) فشەڵ؛ فش‌و فشۆڵ *(a ~ cake)* .
(۱۳) سووکەڵە؛ خێرا ڕەوت؛ خۆش ڕەوت: *(She is ~ on her feet.)* .
(۱٤) بار سووک؛ بە سووکی: *(We will travel ~ .)* .
(۱۵) (ا) هێز نەخراوە سەر (برگە– دەنگناسی). (ب) لەڕ (تیپ، پیت).
(۱٦) سووک (چەک) *(a ~ tank)*

*adv.* (۱) بە هێواشی· بە ئەسپایی؛ بە ئاستەم؛ لەسەرخۆ
(۲) بە بار سووکی؛ بە سووکی: *(traveling ~)* .

*v.i.* (۱) دابەزین؛ هاتنەخوارەوە (لە ئوتومبیل، وولاخ).
(۲) نیشتنەوە (باڵندە).
(۳) (~ on; ~ upon)، هاتن بەسەردا بە ڕێکەوت؛ بە ڕێکەوت دۆزینەوە:
*(to ~ on a rare book in a second-hand shop)*
(٤) لەپڕ لێ بەسەرهاتن؛ لەپڕ لێ ڕوودان:
*(Misfortune ~ed upon him.)*

**light in the head,** (۱) گێژ. (۲) مێشک سووک؛ منداڵ؛ حولحولی.

**light into, [Slang].** (۱) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
(۲) سەرزەنشتکردن؛ شکاندن.

**light out, [Slang].** تێ ئەقاندن؛ هەڵاتن؛ پێ پێوەنان؛ بۆ دەربازبوون؛ دەرپەڕین

**make light of,** بە گاڵتە دانەبەر؛ بە سووکی تەماشاکردن؛ گوێ پێ نەدان.

**lighten** (līt'’n), *v.t.* (۱) ڕووناک کردنەوە؛ ڕۆشنکردنەوە.
(۲) کردنەوە (ڕەنگ)؛ کاڵ کردنەوە.
(۳) بیر ڕۆشنکردنەوە؛ مێشک کردنەوە؛ فێرکردن.

*v.i.* (۱) ڕووناک بوونەوە؛ ڕۆشن بوونەوە. (۲) بریقەدانەوە؛ بریسکەدانەوە.
(۳) برووسکەدان

**lighten** (līt'’n), *v.t.* (۱) سووک کردن؛ بار سووک کردن؛ بار کەمکردنەوە.
(۲) ئەرکی سەرشان کەمکردنەوە؛ سەرئێشە کەمکردنەوە؛ بە ئاسانی تر گرتن؛ ڕێ دان بۆ هەناسەدان (۳) دڵخۆش کردن؛ دڵ کردنەوە.

*v.i.* (۱) سووک بوون؛ بار سووک بوون؛ کەم بوونەوە.
(۲) ئەرکی سەرشان سووک بوون؛ ئاسانتر بوون.
(۳) دڵخۆش بوون؛ دڵ کرانەوە.

**lighter** (līt'ẽr), *n.* داگیرسێنەر؛ چەرخ؛ ئەستێ: *(a cigarette ~)* .

**lighter** (līt'ẽr), *n.* بەلەمی بارداگرتن‌و بارکردنی کەشتی باری گەورە کە ناتوانن نزیک بەندەر بکەونەوە لەبەر تەنکایی.

**lighterage** (līt'ẽr-ij), *n.* (۱) بارکردن‌و بارداگرتنی کەشتی باری گەورە بە بەلەمی بار (ئەو کەشتییانەی ناتوانن بێنە تەنکاوی بەندەرەوە).
(۲) کرێی ئەم بارکردن‌و داگرتنە.

**lightface** (līt'fās´), *n.* تیپی باریک‌و کاڵ (چاپەمەنی).

**light-fingered** (līt'fiŋ'gẽrd), *adj.* (۱) دەست سووک.
(۲) دەست باڵا لە گیرفان بڕیندا؛ دز؛ لێهاتوو لە دزیدا.

**light-footed** (līt'foot'id), *adj.* سووکەڵە (ڕۆیشتن)؛ خێرا.

**light-handed** (līt'han'did), *adj.* (۱) دەست سووک
(۲) دەستبەتاڵ؛ کەم هەڵگرتوو بە دەست.

**light-headed** (līt'hed'id), *adj.* (۱) گێژ
(۲) شەیدا· گەشکەدار؛ سەرخۆش.
(۳) فشقی· مێشک سووک؛ منداڵ؛ حولحول؛ هیچ‌وپووچ (مرۆڤ).

**light-hearted** (līt'här'tid), *adj.* بێباک؛ بێ خەم‌وخەفەت؛ مەراق نەخۆر.

**light-house** (līt'hous´), *n.* بورجی ڕووناکی کەناری دەریا (بۆ ڕابەری کەشتییەوانان)؛ تیشکی ڕێنوما (بۆ ڕابەری کەشتی).

**lighting** (līt'iŋ), *n.* (۱) داگیرسان؛ داگیرساندن.
(۲) ڕووناک کردنەوە؛ ڕووناک بوونەوە؛ ڕووناکی.
(۳) ڕێکخستن‌و دابەشکردنی ڕووناکی‌و تاریکی لە وێنەیەکدا.
(٤) ڕێک‌وپێک کردنی ڕووناکی سەر شانۆ.

**lightly** (līt'li), *adv.* (۱) بە هێواشی· بە ئەسپایی؛ بە ئاستەم؛ لەسەرخۆ: *(to touch something ~)*
(۲) کەم؛ ئەختێک: *(to spend ~)* .
(۳) بە گورج‌وگۆڵی؛ خێرا
(٤) بە خۆشی؛ بە دڵخۆشی؛ بە پێکەنینەوە.
(۵) بە لامسەرلایی؛ بە بێباکانە؛ بە سووکی: *(to take something ~)* .
(٦) بێ ئابڕووانە؛ بە بێ شەرمانە.

**light-minded** (līt'mīn'did), *adj.* مێشک سووک؛ هیچ‌وپووچ (مرۆڤ)؛ منداڵ (ڕەووشت)؛ فشقی.

**lightness** (līt'nis), *n.* (۱) ڕووناکی؛ ڕۆشنی. (۲) سپێتی؛ سپیکەڵەیی.

**lightness** (līt'nis), *n.* (۱) سووکی؛ سووکێتی.
(۲) خێرایی؛ سووکەڵەیی؛ گورج‌وگۆڵی.
(۳) بێ مەراقی· بێباکی؛ بێ خەم‌وخەفەتی؛ سەرسووکی.
(٤) لامسەرلایی؛ بە گاڵتە دانەبەر؛ بە سووکی گرتن.

**lightning** (līt'niŋ), *n.* هەورە برووسکە؛ برووسکە؛ چەخماخە.

**lightning bug (or beetle),** = firefly.

**lightning rod,** بەربەستکەری هەورەتریشقە

**lights** (līts), *n.pl.* سیی ئاژەڵ.

**lightship** (līt'ship´), *n.* کەشتی چرای ووریاکەرەوە: کەشتییەکی چراداره لە شوێنێکی پڕ مەترسیدا لەنگەر دەخات‌و بە چراکەی کەشتییەوان ووریا دەکاتەوە کە نزیکی ئەو شوێنە نەکەون.

**lightsome** (līt'səm), *adj.* (۱) گورج‌وگۆڵ؛ خێرا؛ بە هەڵمەت؛ زیت.
(۲) دڵشاد؛ بێ مەراق؛ بێباک؛ بەکەیف. (۳) هیچ‌وپووچ (مرۆڤ)؛ فشقی

**lightsome** (līt'səm), *adj.* (۱) ڕووناکی دەرەوە؛ ڕۆشنکەرەوە
(۲) ڕووناک؛ ڕۆشن.

**lightweight** (līt'wāt´), *n.* (۱) کەسێکی سەنگ سووک.
(۲) [Colloq.]، کەسێکی هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ: *(He is a ~ .)*
(۳) بۆکسبازێکە سەنگی لە نێوان ۱۲۷–۱۳۵ پاوەندا بێ.

*adj.* (۱) سەنگ سووک؛ سووک. (۲) (ا) هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ.
(ب) سەنگ لەنێوان ۱۲۷-۱۳۵ پاوەندا.

**lightwood** (līt'wood´), *n.* داری خۆش سووت.

**light-year** (līt'yêr´), *n.* تیشکە ساڵ.

**ligneous** (lig'ni-əs), *adj.* دارین؛ داری؛ وەک دار وایە.

**ligni-, lign-, ligno-** (lig'ni), . پێشگرێکە بەمانای: دار: *(lignify)*

**lignify** (lig'nə-fī'), *v.t.* کردن بە دار؛ وەک دار لێکردن؛ کردن بە ڕیشاڵی دارین.

*v.i.* بوون بە دار؛ ڕیشاڵی دارین لێ پێکهاتن.

**lignin** (lig'nin), *n.* ماددەیەکە ڕیشاڵی داری لێ درووست دەبێت.

**lignite** (lig'nīt), *n.* جۆرە خەڵووزێکی قاوەییە.

**lignocellulose** (lig´nō-sel'yoo-lōs´), *n.* سیلۆلۆزی دارین؛ ئاوێتەی سیلۆلۆزو ماددەیەکی ترە ڕیشاڵی داری لێ پێکدێت.

**ligula** (lig'yoo-lə), *n.* = ligule.

**ligule** (lig'ūl), *n.* (۱) زمانەی هەندێ کۆپەڕەی گوڵ.
(۲) پەردەیەکی تەنکە لە بنی گەڵای گیادا کە گەڵاکەو لاسکەکە بەیەک دەگەن
(۳) دەمی هەندێ جانەوەر

**ligure** (lig'yoor), *n.* جۆرە بەردێکی بەنرخە

**likable, likeable** (līk'ə-b'l), *adj.* ڕووخۆش‌و باش؛ ئێسک سووک؛ کوڕی باش؛ کچی باش: *(a ~ person)* .

**like** (līk), *adj.* (۱) وەک؛ هەمان. (۲) وەک یەک.

*adv.* (۱) وەک؛ دەڵێی: *(He works ~ a mad.)* .
(۲) [Colloq.]، لەوانەیە.

*prep.* (١) وەك؛ لێچوو: ***(She is ~ a bird.)***.
(٢) لەسەر هەمان شێوە؛ وەك: ***(She sings ~ a bird.)***.
(٣) لێوەشانەوە ***(It was not ~ him to forget her birthday.)***.
(٤) حەزلێکەر؛ ویستوو: ***(I feel ~ sleeping.)***.
(٥) لەوە دەچێ: وا دیارە: ***(It looks ~ a clear day tomorrow.)***.
***conj.*** [Colloq.]. (١) وەك ***(It was just ~ you said.)***.
(٢) لەوە دەچێ: دەڵێی: ***(It looks ~ he is signalling to us.)***.
***n.*** هاوتا ***(I have never seen the ~ of it.)***.
***v.t.*** [Obs.], لێکچوواندن: بەراووردکردن.
***v.i.*** [Dial.], خەریك بوون: نزیك بوون لە کردنی کارێك.
**and the like,** وە هەروەها: هەتا دوایی؛ هتد...
**nothing like,** زۆر جیاواز لە؛ هیچ لە یەك ناکەن.
**something like,** وەك: نزیکە لەوەوە.
**the like ( or likes ) of,** [Colloq.]. کەسانی وەك فلان و فلان؛ شتی وەك

**like** (līk), ***v.i.*** (١) بە دڵ بوون: بۆ لووان: بۆ شیان: ***(It ~s me not.)***.
(٢) ویستن: حەزکردن؛ هەوەس لێ بوون.
***v.t.*** (١) حەزلێکردن: خۆشویستن: ویستن: بە دڵ بوون: دڵ پێوەبوون
(٢) خۆزگە حواستن؛ بریا ***(I should ~ to go there.)***.
***n.pl.*** شتی ویستراو یا بە دڵ بوو؛ شتی حەزلێکراو:
***(We know nothing of his ~s and dislikes.)***

**-like** (līk), پاشگرێکە بەمانای - ئاسا؛ وەك:
***(doglike, manlike, homelike)***

**likeable** (līk′ə-b'l), ***adj.*** = **likable.**

**likelihood** (līk′li-hood′), ***n.*** لەوانەبوون: بۆهەبوون: شیان؛ ڕێ تێ چوون
**in all likelihood,** زۆر لەوانەیە؛ زۆر ڕێی تێ دەچێ.

**likely** (līk′li), ***adj.*** (١) لەوانەیە: ڕەنگە:
***(They are ~ to become angry with him.)***
(٢) ڕێی تێ دەچێ؛ جێی بڕوایە؛ دەشێ: بەجێ:
***(a ~ excuse; a ~ account of the flight)***
(٣) شیاو؛ گونجاو ***(a ~ place to find deer)***.
(٤) هیوای سەرکەوتنی لێ دەکرێ؛ دوارۆژێکی باشی هەیە: ***(a ~ lad)***
***adv.*** لەوانەیە: ڕەنگە: بۆی هەیە؛ ڕێی تێ دەچێ ***(He will very ~ go.)***.

**like-minded** (līk′mīn′did), ***adj.*** هاوبیرور

**liken** (līk′n), ***v.t.*** لێکچوواندن: لێچوواندن؛ بەراووردکردن.

**likeness** (līk′nis), ***n.*** (١) لەیەکچوون: لەیەك کردن.
(٢) شێوە. (٣) وێنە.

**likewise** (līk′wīz′), ***adv.*** (١) بە هەمان چەشن: بە هەمان شێوە
(٢) هەروەها

**liking** (līk′iŋ), ***n.*** (١) خۆشویستن: حەز. (٢) ویستن
(٣) بە دڵ بوون: بەلاوە باش بوون: مەیل لێ بوون ***(not to my ~)***.

**lilac** (lī′lək), ***n.*** (١) لەیلاق (٢) گوڵە لەیلان
(٣) ڕەنگی ئەرخەوانی کاڵ.

**Lilliputian** (lil′ə-pū′shən), ***n.*** (١) نیشتەجێیەکی بستەبالای دوورگەی "لیلیپیوت"ی نەدیدە یا خەیاڵییە کە نووسەری ئینگلیزی بەناوبانگ "سویفت" لە چیرۆکی "گەشتەکانی گەلیڤەرز"دا باسی کردووە.
(٢) [I.]. کەسێکی بستەبالا. (٣) [I.]. کەسێکی هیچ‌وپووچ و بێ بایەخ.
***adj.*** (١) تایبەتی بە دوورگەی "لیلیپوت" و دانیشتووەکانی.
(٢) [I.]. زۆر بچووك: بستەبالا (٣) [I.]. هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ

**lilt** (lilt), ***v.t. & v.i.*** گۆرانی ووتن یا دووان بە دەنگێکی خۆش ئەوا.
***n.*** (١) گۆرانییەکی خۆش: گۆرانییەکی خۆش ئەوا.
(٢) جووڵانەوەیەکی ئاسکانە و سووك و جوان

**lily** (lil′i), ***n.*** (١) شلێر؛ زەمەق: زەنبەق: چەند جۆرە ڕووەکێکن گوڵی هەمەڕەنگی کەمێك بۆن خۆش دەگرن
(٢) گوڵی ئەم ڕووەکانە؛ گوڵە زەنبەق؛ گوڵە شلێر.
***adj.*** جوان و ئاسك و پاك و سپی و بێگەرد وەك گوڵە زەنبەق.

**lily-livered** (lil′i-liv′ērd), ***adj.*** ترسنۆك؛ بێ غیرەت.

**lily-white** (lil′i-wīt′), ***adj.*** (١) سپی وەك گوڵە زەنبەق.
(٢) بێگەرد؛ پاك.
(٣) [Colloq.]، ڕەگەزپەرست بەرامبەر بە قولەڕەش.

**limb** (lim), ***n.*** (١) پەل (دەست، لاق، قاچ)؛ دەست و پێ.
(٢) لق؛ لقەدار؛ پەلی درەخت.
(٣) بەش؛ پەل؛ لق: ***(A policeman is a ~ of the law.)***.
(٤) منداڵێکی بێ حەیا و چەقاوەسوو.
***v.t.*** پەل بڕینەوە؛ پەل لێکردنەوە؛ پارچە پارچە کردن.
**out on a limb,** [Colloq.], لە بارێکی پڕ مەترسیدایە.

**limb** (lim), ***n.*** (١) قەراغی مانگ و ڕۆژ و ئەستێرە.
(٢) قەراغی ئامێری گۆشەپێو.
(٣) ڕۆپەی کۆپەڕەی گوڵ (کە پانترین بەشی گوڵەکەیە).

**limber** (lim′bēr), ***adj.*** نەرم؛ جیر؛ بە کێشمان؛ بە ئاسانی دەنوشتێتەوە: ***(a ~ body)***.
***v.t.*** نەرم‌ونۆڵ کردن؛ شلك کردن: ***(Exercise ~s the body.)***.
***v.i.*** لەشی خۆ شلك کردن: ***(The dancers were ~ing up.)***.

**limber** (lim′bēr), ***n.*** گالیسکەی جەنگی (کە ئاژووقەی جەنگی پێ هەڵدەگیرێ).
***v.t. & v.i.*** پێوەبەستنی تۆپ بە گالیسکەی جەنگییە.

**limbo** (lim′bō), ***n.*** (١) ناوچەیەکە لە قەراغی دۆزەخدا گیانی خەڵکی پێش عیسا و منداڵی نەکراو بە خاچ پەرستی تێ دەخرێت ئەگەرچی تاوانیشیان نەبێ (خاچ پەرستی). (٢) (ا) بەندیخانە؛ شوێنی ڕاگرتن یا گلدانەوە
(ب) بەندیتی؛ بەسترانەوە.
(٣) (ا) خرانە پشت گوێ؛ فەرامۆش کران؛ گوێ پێ نەدران.
(ب) نیشتەجێی مرۆڤ و شتی نەویستراو و گوێ پێ نەدراو.
(٤) (ا) بارێکە کە نە لێرە بێ و نە لەوێ؛ بارێکە کە مرۆڤ دەستی تێیدا بەسترابێتەوە و هیچی پێ نەکرێ: ***(He has been in ~ for years.)***
(ب) شوێنی چاوەڕێ کردن؛ شوێنێکە کە لەنێوان دوو شوێنی تردا بێ و هیچی تێدا ڕوو نەدات.

**lime** (līm), ***n.*** (١) دەموکانە؛ سرێشێکە دەدرێت لە داروودرەخت بۆ ئەوەی باڵندەی پێوە بنووسێ بۆ ڕاوکردنی. (٢) گەچ؛ قسڵ.
***v.t.*** (١) دەموکانە لێدان؛ سرێش لێدان بۆ باڵندە گرتن.
(٢) ڕاوکردن بە دەموکانە؛ بە تەڵەوە کردن.
(٣) گەچکاری کردن. (٤) بە گەچ قایم کردن.

**lime** (līm), ***n.*** (١) لیمۆی ترش. (٢) دار لیمۆی ترش.
***adj.*** (١) بە لیمۆی ترش کراو. (٢) تامی لیمۆی ترش دەدات.

**lime** (līm), ***n.*** سنجوو؛ جۆرە درەختێکە.

**limeade** (līm′ād′), ***n.*** ئاوی لیمۆترش؛ خۆشاوی لیمۆترش.

**limekiln** (līm′kil′, līm′kiln′), ***n.*** کوورە گەچ.

**limelight** (līm′līt′), ***n.*** (١) شەوقێکی بەهێز؛ ڕووناکییەکی بە شەوق.
(٢) شوێنی شەوق لەسەری شانۆ.
(٣) شوێنێکە زۆر لەبەرچاوی جەماوەر بێ:
***(He is in the ~ because of his job.)***

**limen** (lī′men), ***n.*** کەمترین هاندان کە ئەنجامی هەستی بدات (دەروونناسی).

**limerick** (lim′ēr-ik), ***n.*** هەڵبەستێکی پێنج خشتەکی هیچ‌وپووچ و سەیر هەر بۆ پێکەنین.

**limestone** (līm′stōn′), ***n.*** بەردەگەچ.

**lime tree,** (١) سنجوو؛ جۆرە درەختێکە. (٢) **tupelo**.

**limey** (lim′i), ***n.*** [Slang], (١) سەربازی ئینگلیزی؛ کەشتییەوانی ئینگلیزی (لەڕووی سووکییەوە). (٢) ئینگلیزێك (لەڕووی سووکییەوە)

**limicoline** (lī-mik′ə-līn′), ***adj.*** تایبەتی بە باڵندەی کەنار دەریا.

**limit** (lim′it), ***n.*** (١) ڕاده؛ سنوور
(٢) (*pl*) سنوور. ***( within the city ~s )*** .
(٣) پەڕی ئەوپەڕ: ئەندازەی ڕێ دراو.
***v.t.*** سنوور بۆ دانان: کەمکردنەوە؛ وەستاندن:
***( to ~ the powers of the State)***
**limitation** (lim´ə-tā′shən), ***n.*** (١) سنوور دانان؛ سنوور بۆ دانران.
(٢) سنوور (٣) کەموکووڕی: ***( We all have our ~s.)*** .
(٤) ماوەی مافی دان بە دادگا.
**limited** (lim′it-id), ***adj.*** (١) سنووردار: ڕادەدار؛ بەستراوە.
(٢) کەم ***( a ~ success)*** .
(٣) بەستراوە بە دەستوور: ***( a ~ monarch)*** .
(٤) تەنها لە چەند شوێنێك دەوەستێت و ڕێبوار کەم هەڵدەگرێت (شەمەندەفەر، پاس) (٥) بەرپرسیاری هەر بەشدارێك بەپێی ئەو پارەیەیە کە دایناوە (کۆمپانیای بەشکە): ***( a ~ company)*** .
**limited edition,** لە چاپدانی ژمارەیەکی کەم.
**limiting** (lim′it-iŋ), ***adj.*** (١) بەستەرەوە؛ سنووردانەر:
***( ~ factors)***
(٢) دیاریکەر (ڕێزمان): (وەك لە ووشەی: " this " و " several " لەم دوو دەستەواژەیەدا: " this book " ; " several horses " .
**limitless** (lim′it-lis), ***adj.*** بێ سنوور: بێ ئەندازە؛ بێ پایان؛ لە ڕادە بەدەر؛ یەکجار زۆر.
**limn** (lim), ***v.t.*** (١) وێنەکێشان؛ وێنەکردن؛ نەخشەکێشان.
(٢) [Archaic]. باسکردن؛ وەسف کردن.
(٣) [Obs.]، ڕوونکردنەوەی دەستنووس یا پەرتووك بە وێنە.
**limousine** (lim′ə-zēn´, lim´ə-zēn′), ***n.*** لیموزین. ئوتومبیلی گەورەو جوانو کەشخە
**limp** (limp), ***v.i.*** شەلین؛ لەنگین؛ بە شەلەشەل ڕۆیشتن.
***n.*** شەلی؛ شەلین؛ لەنگین؛ لەنگە.
**limp** (limp), ***adj.*** (١) سیس: شلو شێواو؛ شل؛ خاو.
(٢) لاواز؛ بێ هێز: هیچ لە باردا نەبوو؛ بێ توانا.
**-limply** ***(adv.)***; **limpness** ***(n.)***.
**limpet** (lim′pit), ***n.*** (١) گیاندارێکی قاووغدارە بە بەردی قەراغ دەریاوە دەنووسێت (٢) کەسێکی خۆ هەڵواسێنەر؛ کەسێکە خۆی دەنووسێنێت بە یەکێکی ترەوەو لێی نابێتەوە. (٣) جۆرە تەقەمەنیی‌یەکە دەنووسێنرێ بە لەشی کەشتی‌یەوە
**limpid** (lim′pid), ***adj.*** (١) ڕۆشن: ڕوون (ئاو، ئاووهەوا):
***( ~ streams)***
(٢) ڕوون (نووسراو): ***( ~ prose)*** .
(٣) خامۆش: بێ دەنگ؛ کش‌ومات:
***( The early morning and evening were ~ .)***
**-limpidity; limpidness** ***(n.)***; **limpidly** ***(adv.)***.
**limpkin** (limp′kin), ***n.*** باڵندەیەکی لاق درێژی قاوەییکاری ناو زەلکاوی بە ئاودا ڕۆیشتووە دەنگەکەی لە ناڵە دەچێت.
**limulus** (lim′yoo-ləs), ***n.*** قرژانگە گەورە: شاقرژانگ.
**limy** (lim′i), ***adj.*** (١) لینج؛ شتێکی لینجی وەك دەموکانە لێدراو.
(٢) گەچی: گەچی تێدایە؛ وەك قسڵە.
**linage, lineage** (līn′ij), ***n.*** (١) ژمارەی دێڕی نووسراو یا چاپکراوی لاپەڕەیەك (٢) کرێ دان بە وێژەوان بەپێی ژمارەی دێڕی لاپەڕەیەك.
**linchpin** (linch′pin´), ***n.*** (١) بزماری ڕاگر یا چەسپێنەر: بزمار یا مێخێکی سەرداره دەکرێت بە تەوەرەی ڕەوڕەوەوە بۆ ڕاگرتنی ڕەوڕەوەکەو دەرنەهاتنی (٢) بەشێکی بناغەیی یا سەرەکی؛ بەشێکی یەکخەر.
**linden** (lin′dən), ***n.*** سنجوو: چەند جۆرە درەختێکی گوڵ زەردو بۆن خۆشن گەڵاکانیان لە دڵ دەکات.
**line** (līn), ***n.*** (١) (ا) پەت: گوریس؛ تەل؛ تەناف؛ هێڵ؛ ڕایەڵ.
(ب) تەلی ڕاوەماسی. (ج) شریتی پێوان. (د) (*pl.*) جڵەو؛ لغاو.
(٢) (ا) تەلی تەلەفۆن. (ب) سەرجەمی ئەم تەلانە.
(ج) تەلی تەلەفۆنی بەکارهێنراو: ***( Hold the ~ , please.)*** .
(٣) بۆری؛ تەلی ئەلەکتریك؛ تەلی شت بەر یا گەیێنەر.
(٤) (ا) دێڕ؛ هێڵی نووسین. (ب) هێڵی هەڵکەنراو لەسەر ڕوویەك.
(ج) هێڵی ناو لەپ یا دەموچاو؛ چرچی ناوچەوان.
(٥) (ا) هێڵی دیاری کردنو جیاکردنەوەی وەرزشگا.
(ب) هێڵی دەستپێکردنی پێشبڕکێ: ***( starting- ~ )*** .
(٦) سنوور: ***( the State ~ )*** .
(٧) هێڵی دیاری کردن؛ هێڵی جیاکردنەوە.
(٨) چێوە؛ کەمەرە؛ چوارچێوە؛ ڕووخساری گشتی.
(٩) (*pl.*) چارەنووس؛ باری ژیان.
(١٠) (*pl.*) نەخشەکار. (١١) ڕیز.
(١٢) پەیڕەویکاری؛ ڕێی ڕاست؛ هاوڕەووشتی:
***( He brought the troublemakers into ~ .)***
(١٣) یەك لە دوای یەکی؛ ڕیز؛ دوابەدوایی:
***( a ~ of Democratic presidents)***
(١٤) بنەچە؛ باووباپیر.
(١٥) (ا) هاتوچۆی ڕێك‌وپێك (شەمەندەفەر، پاس، کەشتی).
(ب) کۆمپانیای هاتوچۆ.
(ج) لقی کۆمپانیایەکی هاتوچۆ.
(د) هێڵی شەمەندەفەر.
(١٦) ڕێباز: ڕێڕەو؛ ڕوو: ***( the ~ of fire)*** .
(١٧) بار (ڕەووشت، کردار، ڕوونکردنەوە)؛ ڕێی بۆچوون:
***( What was the ~ of his argument?)***
(١٨) پیشە: ***( his ~ of work)*** .
(١٩) جۆر (شتومەك).
(٢٠) پسپۆری؛ مەودای لێ زانین یا شارەزایی:
***( Debating was right in his ~ .)***
(٢١) نامەیەکی کورت؛ پۆستکارت:
***( Drop me a ~ when you get home.)***
(٢٢) (ا) دێڕی هۆنراوە.
(ب) دێڕی هۆنراوەی تایبەتی بە هۆنەرێك: ***( Marlowe's mighty ~ )*** .
(٢٣) (*pl.*) سەرجەمی ووتە یا گوفتاری نووانده‌ری شانۆنامەیەك:
***( learning his ~s)***
(٢٤) دوانزەیەکی گرێ یا ئینجێك.
(٢٥) ڕیزی یاریکەر (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
(٢٦) کەمەرە (زەوی)؛ چێوە (جوگرافیا). (٢٧) هێڵ (بیرکاری).
(٢٨) (ا) ڕیز (لەشکر، کەشتی جەنگ).
(ب) ڕیزی پێشەوەی لەشکر؛ بەرایی لەشکر؛ بەرایی جەنگ.
(ج) لقی جەنگکەری لەشکر. (د) ئەفسەری کەشتی جەنگ لەکاتی جەنگدا.
***v.t.*** (١) هێڵ پیاهێنان؛ خەت لێدان؛ کوژاندنەوە.
(٢) ( **~ up** )، ڕیزکردن؛ ڕێکخستن:
***( The general ~ed up his troops.)***
(٣) بە درێژایی شوێنێك درێژبوونەوە؛ بە درێژایی قەراغێکدا ڕووان یا پێکهاتن
***( Tall trees ~ the streets.)***
(٤) خستنەسەر قەراغ.
***v.i.*** ( **~ up** ), ڕیزبوون: ***( The soldiers quickly ~ed up.)*** .
**all along the line,** (١) لە هەمووشوێنێکدا.
(٢) هەمیشە؛ هەموو کاتێك
**bring into line,** (١) هێنانە ناو ڕیزەوە؛ ڕیزکردن.
(٢) خستنەژێر دەستەوە؛ ڕاستکردنەوە (ڕەووشت)؛ جڵەوگرتن.
**come into line,** (١) هاتنە ناو ڕیزەوە؛ ڕاست بوونەوە.
(٢) [Colloq.]، گونجان؛ لەگەڵ ڕێك کەوتن.
(٣) [Colloq.]، ڕەووشتی خۆ چاك کردن؛ جڵەوی خۆ گرتنەوە.
**draw the ( or a ) line,** سنوور بۆ دانان؛ وەستاندن (کردارو ڕەووشتی

ناپەسەند؛

**get a line on,** [Colloq.], بیستن دەربارە؛ پێ زانین؛ بۆ دەرکەوتن.

**hard lines,** [Slang], بێ بەختی؛ بەدبەختی؛ بەخت ڕەشی.

**hold the line,** نەجوولان؛ بەرهەڵستی کردن؛ نەبزوان؛ جێی خۆ بەجێ نەهێشتن؛ بەرنەدان *( to hold the line on inflation)* .

**in line,** (١) ڕێك؛ ڕاست؛ بەریز. (٢) گونجاو؛ یەك تەوا. (٣) ئامادە.

**in line of duty,** لەکاتی بەجێهێنانی ئەرکی سەرشاندا (بەتایبەتی لە سوپادا) *( He died in line of duty.)* .

**line up,** (١) ڕیزبوون؛ ریزکردن؛ ڕێچکە بەستن؛ قەتارە بەستن.

(٢) ڕێکخستن. (٣) بەڵێنی پاڵپشتی کردن لێوەرگرتن

*( to line up support for his plan)*

(٤) هەڵوێستی خۆ ئاشکراکردن.

**on a line,** ڕێك؛ تەخت

**on the line,** (١) خستنە مەترسییەوە؛ مەترسی:

*( He put his reputation on the line.)*

(٢) لە لێرەیەو بە لەوێ.

**out of line,** (١) چەوت؛ لار، خوار؛ ناڕێك.

(٢) نەگونجاو؛ جیاواز؛ لە ڕێ لادەر

*( He is out of line with the rest of the group.)*

(٣) لاسار؛ سەرکێش

**read between the lines,** مانار مەبەستی شاراوەی نووسراو یا ووتار دۆزینەوە؛ خوێندنەوەی نێوان دێڕەکان؛ بۆ مەبەست یا مانای نهێنی گەڕان.

**toe the line,** پەیڕەوی کردنی فەرمان؛ فەرمان جێبەجێکردن؛ مل نان؛ لەسەر ڕێ و شوێن و بەرنامەی دیاریکراو ڕۆیشتن (ئەندامی ڕێکخراوێك یا فەرمانگەیەك)

**line** (līn), *v.t.* (١) بەرتێکرتن (چاکەت، پاڵتۆ).

(٢) گیرفان یا کیسە پڕکردن لە پارە (بەتایبەتی هی دزراو):

*( ~ one's pockets ( or purse) )*

(٣) بەکارهێنان بۆ بەر *( Strong cloth ~ed the trunk.)* .

**lineage** (lin′i-ij), *n.* بنەچە؛ باوباپیر؛ بنەماڵە:

*( a man of good ~ )*

**lineage** (līn′ij), *n.* linage.

**lineal** (lin′i-əl), *adj.* (١) یەکسەر یا ڕاست لە بنەچەوە هاتوو:

*( a ~ descendant ( or heir ))*

(٢) لە باوباپیرەوە بۆ ماوە؛ زگماکی: *( a ~ prerogative)* .

(٣) لە یەك بنەچەن *( ~ relatives)* .

(٤) linear

-lineality *(n.)*; lineally *(adv.)*.

**lineament** (lin′i-ə-mənt), *n.* (١) ڕووخسار؛ سەروسیما.

(٢) نیشانە

**linear** (lin′i-ēr), *adj.* (١) ڕاست؛ ڕێك؛ تایبەتی بە هێڵی ڕاست.

(٢) هێڵ هێڵ؛ هێڵدار (هونەر، نەخشە): *( a ~ design)* .

(٣) یەکلایی؛ تەنها درێژە؛ تەنها بە درێژاییە

(٤) باریك و درێژ: *( a ~ leaf)*

**linear equation,** هاوکێشە هێڵی (حەس): هاوکێشەی یەکجا.

**linear measure,** (١) پێوانەی دووری

**lineate** (lin′i-it, lin′i-āt′), *adj. Also* lineated, هێل هێل؛ هێلدار؛ هێڵدار.

**lineation** (lin′i-ā′shən), *n.* (١) بە هێڵ نیشانەکردن؛ دیاری کردن بە هێڵ (٢) چێوە؛ چوارچێوە؛ کەمەرە.

(٣) نەخشەیەکی هێڵی

**lineman** (līn′mən), *n.* (١) پێوەری ڕووی زەوی.

(٢) دانەرو چاککەری تەلی تەلەفۆن و ئەلەکتریك

( پێشی دەوترێ " linesman " ).

(٣) پشکنیاری هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر.

(٤) یاریکەری هێرشبەر (فوتبۆڵی ئەمەریکی).

**linen** (lin′ən), *n.* (١) کەتان؛ ڕێس و دەزوو قوماشی کەتان.

(٢) شتومەکی کەتان (بەرگە سەرین و دۆشەك، سەرمێز... هتد).

(٣) جل وبەرگی کەتان (کراس، دەرپێ و فانیلە).

(٤) کاغەزی تەنکی کەتان.

*adj.* کەتان؛ لە کەتان درووستکراو: *( ~ thread)* .

**wash one's dirty linen in public,** باسکردنی ناکۆکی خێزانی و ناوخۆ لەبەرچاوی خەڵك.

**line of credit,** = credit line.

**lineolate** (lin′i-ə-lāt′), *adj.* هێڵی باریك وهاوڕێکدار (زیندەوەرزانی).

**liner** (līn′ēr), *n.* (١) هێڵ کێش.

(٢) کەشتی هەڵمی سواری و فڕۆکەی سەر ڕێگەیەکی تایبەتی (کە هاتوچۆی ڕێك وپێك دەکەن).

**liner** (līn′ēr), *n.* (١) کەسێکە کە بەر دەگرێتە جل وبەرگ.

(٢) بەر (جل وبەرگ، کڵاوزری): *( a helmet ~ )* .

**linesman** (līnz′mən), *n.* (١) lineman .

(٢) یاریدەدەری سەرپشکی وەرزش (کە ئیشی ئەوەیە بزانێ تۆپەکە لە کوێی یاریگادایەو ئایا لە دەرەوەیە یان لە ناوەوەیە) (بەتایبەتی لە " تەنس "و " فتبۆڵی ئەمەریکیدا " ).

**line up,** (١) ڕیزبوون؛ ڕیزکردن.

(٢) جووت کردن؛ لەگەڵ یەکتری بە ڕاستی دانان.

(٣) کۆمەڵ کردن؛ گردکردنەوە.

*( She ~ed up a lot of evidence against him.)*

(٤) لایەنگری کردن.

**line-up** (līn′up′), *n.* (١) ڕیزە خەڵك (بەتایبەتی گومانباران لە پۆلیسخانەدا بۆ پشکنین یا ناسینەوەیان و دۆزینەوەی تاوانبارەکە).

(٢) (ا) ئەندامی دەست بە یاریکەری تیپ: *( a football ~ )* .

(ب) لیستەی ئەم یاریکەرانە.

(٣) یەککگرتنی کۆمەڵە خەڵك، حیزب، ڕێکخراو، یا کۆمپانیای هاومەبەست و هاوئامانج و هاوبیروڕا.

**ling** (liŋ), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریاییە

**-ling** (liŋ), پاشگرێکە بەمانای: (١) بچکۆلە؛ بچووك: *(duckling)* .

(٢) هیچ وپووچ؛ بێ بایەخ؛ بۆگەن وپیس: *( princeling, hireling)*

**-ling** (liŋ), پاشگرێکە بەمانای: بەرەو؛ ڕادە؛ بار: *(darkling)* .

**linger** (liŋ′gēr), *v.i.* (١) مانەوە لە شوێنێك زیاد لە پێویست؛ زۆر بەنگ بوون؛ خۆ دواخستن:

*( He ~ed about after everyone has left.; Don't ~ too much.)*

(٢) سستی نوواندن؛ خاوەخاوکردن: *( to ~ over one's work)* .

(٣) درێژەکێشان بە گیانەلایی؛ زۆر مانەوە بە گیانەلایی.

(٤) بەردەوام بوون هەرچی چەند بە کزیش بێت؛ نەبڕانەوە:

*( The memory still ~s.)*

*v.t.* کات کوشتن؛ کات بەفیڕۆدان.

**lingerie** (län′zhə-rē′), *n.* (١) جل وبەرگی کەتان.

(٢) جلی ژێرەوەی ژن؛ ژێرکراس.

**lingo** (liŋ′gō), *n.* زمان و زاراوەی تایبەتی بە پیشەیەك کە هەر ئەندامانی ئەو پیشەیە تێی دەگەن (لەڕووی گاڵتە یا سووکییەوە):

*( the ~ of medical men)*

**lingua** (liŋ′gwə), *n.* زمان یا ئەندامێکی لە زمان چووی لەش.

**lingua franca** (liŋ′gwə fraŋ′kə), (١) زمانی ناوکۆ: (ا) زمانێکی تێکەڵاوە لە ئیتاڵی و فەرەنسی و ئیسپانی و یۆنانی و تورکی و عەرەبی کە لە بەندەرەکانی ڕۆژهەڵاتدا قسەی پێ دەکرێت. (ب) زمانێکی دووڕەگە کە خەڵکی چەند وڵاتێکی زمان جیاواز قسەی پێ دەکەن و بە هۆیەوە لەیەکتری دەگەن. (٢) هۆی لەیەکترگەیشتن.

**lingual** (liŋ′gwəl), *adj.* (١) زمانی (ئەندام). (٢) بە زمان دەبێژرێ.

*n.* دەنگێك یا تیپێکە کە بەتایبەتی بە زمان دەبێژرێ.

وەك: " l, t " دەنگناسی ).

**linguiform** (liŋ′gwi-fôrm′), *adj.* لە زمان دەچێت.

**linguist** (liŋ′gwist), *n.* (١) کەسێکی چەند زمان زان. (٢) زمانەوان؛ زانای زمان؛ زمانزان.

**linguistic** (liŋ-gwis′tik), *adj.* (١) زمانی؛ تایبەتی بە زمان. (٢) تایبەتی بە زمانەوانی.

**linguistically** (liŋ-gwis′ti-k'l-i), *adv.* لەڕووی زمانەوانییەوە؛ لەڕووی زمانەوە

**linguistics** (liŋ-gwis′tiks), *n.pl.* زمانەوانی؛ زمانزانی؛ زانستی زمان.

**lingulate** (liŋ′gyoo-lāt′), *adj.* لە زمان دەچێت.

**liniment** (lin′ə-mənt), *n.* مەلحەمێکی شلە

**lining** (līn′iŋ), *n.* (١) بەرتێگرتن (کەوا، چاکەت، پالتۆ). (٢) بەر (کەواو چاکەتو پالتۆ). (٣) ناوپۆش؛ ناواخن.

**link** (liŋk), *n.* (١) ئەلقەی زنجیر؛ ئەلقە. (٢) (ا) پارچەیەك باسترمە کە بەشێکە لە زنجیرەیەکی بەپەتەوەکراو. (ب) برگە؛ ئەلقە؛ بەش؛ بەند. ( *a weak ~ in the evidence)*. (٣) cuff link (٤) پەیوەندی؛ بەند. ( *a ~ with the past)*. (٥) سەد یەکی زنجیری ڕووپێوی زەوی (کە بریتییە لە ٧,٩٢ ئینچ). (٦) شیشی ووزە گەیاندنو بزواندن (مەکینەچێتی).

*v.t.* پێکەوەبەستن؛ لەیەکدان؛ پەك پێگرتن.

*v.i.* پێکەوەبەستران؛ لەیەکدان.

**link** (liŋk), *n.* مەشخەل (بۆ بەرپێی خۆ بینین).

**linkage** (liŋk′ij), *n.* (١) لەیەکدان؛ پێکەوەبەستن. (٢) زنجیرەی ووزە یا بزووتن گەیاندن. (٣) پەیوەندی نزیکی دوو جین یا زیاتر (زیندەوەرزانی).

**link-boy** (liŋk′boi′), *n.* مەشخەڵچی هەڵگری مەشخەڵێکە بۆ ڕێ ڕووناك کردنەوە بۆ خەڵك لە شەودا. (پێشی دەوترێ: **linkman** ).

**linking verb,** کرداری بێ هێز؛ کرداری پەیوەست: ( *be, is, are, appear, seem, become, etc.)*

**link-man** (liŋk′mən), *n.* = **link-boy.**

**linn** (lin), *n.* (١) تافگە (٢) گۆمی ژێر تافگە. (٣) چەمی لێژ.

**linnet** (lin′it), *n.* باڵندەیەکی بچووکی قاوەیی دەنگ خۆشە.

**linoleum** (li-nō′li-əm), *n.* مشەمای زەمینە داپۆشین.

**linseed** (lin′sēd′), *n.* تۆوکەتان

**linseed oil,** ڕۆنی تۆوکەتان

**lint** (lint), *n.* (١) سارغی؛ لۆکەی برین پێچان. (٢) تۆبەڵە ریشاڵێکە کە لە جل دەبێتەوەو شی دەبێتەوە (وەك لەدوای جل شتن). (٣) ریشاڵی دەوری تۆوی پەموو

**lintel** (lin′t'l), *n.* چێوی سەر دەرگاو پەنجەرە؛ سەر دەرگاو پەنجەرە.

**linter** (lin′tẽr), *n.* (١) مەکینەی لێکردنەوەی ریشاڵە کورتەکانی کە بە تۆوی پەمووەوە دەمێنێتەوە پاش جیاکردنەوەی پەموو لە تۆوەکەی. (٢) ( *pl* ) ئەم ریشاڵە کورتانە (کە دەکرێن بە سارغی ئەستووری شت هەڵچنین).

**lint-white** (lint′hwīt′), *n.* = linnet.

**lion** (lī′ən), *n.* (١) شێر؛ نێرە شێر. (٢) کەسێکی ئازا. (٣) کەسێکی بەناوبانگ. (٤) درووشمی ئینگلتەرە. (٥) (ا) کۆئەستێرەی شێر. (ب) پێنجەم بورج (ئەستێرەوانی).

**lioness** (lī′ən-is), *n.* شێری دایکە؛ شێری مێینە.

**lionet** (lī′ən-et′), *n.* بەچکە شێر

**lion-hearted** (lī′ən-här′tid), *adj.* زۆر ئازا

**lionize** (lī′ən-īz′), *v.t.* (١) شکۆپێدان؛ زۆر ڕێزلێگرتن (وەك لە کەسێکی ناودار). (٢) [Rare]، سەردان لە جێگە خۆش و بەناوبانگەکانی شارێك.

**lion's share,** بەشی شێر؛ بەشی گەورەو باش؛ بەشی زل

**lip** (lip), *n.* (١) لێو؛ لچ. (٢) شتێکی وەك لێو: (ا) قەراغی برین. (ب) لێو یا دەمی سوراحیو پیاڵەو کووپ... هتد. (ج) دەمی شمشاڵو کەرەنا (د) دەمی تیغ. (٣) [Slang]، قسەی قۆڕو ناشرین.

*v.t.* (١) ماچ کردن؛ لێو تێوەدان؛ لێو لێدان. (٢) لێو خستنەسەر شمشاڵ یا کەرەنا بۆ لێدانی.

*adj.* (١) سەرزاری؛ درۆ؛ تەنها بە دەم: ( *~ service)* . (٢) لێوی (دەنگناسی)؛ بە لێو بێژراو (تیپ): ( *a ~ consonant)* .

bite one's lips, لێوی خۆ گەستن؛ خۆگرتنو تووڕەیی و پەستی پیشان نەدان.

hang on the lips of, بە ووردی گوێ لێگرتن؛ باش سەرنج پێدان.

keep a stiff upper lip, [Colloq.], وورە بەرنەدان؛ نەترسان.

smack one's lips, شەقە لە لێو هەڵساندن لە خۆشیدا.

**lipid** (lī′pid, lip′id), *n. Also* **lipide,** چەوری و ماددەی تری وەك چەوری (کە لەگەڵ پرۆتینات و نیشاستەدا بناغەی شانەن).

**lipo-, lip-** (lip′ō, lip′ə), پێشگرێکە بەمانای: چەور؛ چەوری.

**lipoma** (li-pō′mə), *n.* برینی چەورە ریشان.

**lip-read** (lip′rēd′), *v.t. & v.i.* لێو خوێندنەوە.

-lip-reader *(n.)*.

**lip service,** لایەنگری درۆ؛ پاڵپشتی سەرزاری؛ تەنها بە دەم: *( to pay ~ to a cause, an idea, a person, etc.)*

**lipstick** (lip′stik′), *n.* سووراوی لێو.

**liquate** (lī′kwāt), *v.t.* جیاکردنەوەی کانزای دارشتەیەك لە یەکتر بە تواندنەوە.

**liquefaction** (lik′wə-fak′shən), *n.* کردن بە شلە؛ بوون بە شلە

**liquefy** (lik′wə-fī′), *v.t.* کردن بە شلە؛ گۆڕین بە شلە. (ا) بە تواندنەوەی شتی ڕەق (ب) بە گۆڕینی گاز بە شلە.

*v.i.* بوون بە شلە.

**liquescent** (li-kwes′'nt), *adj.* دەتوێتەوە؛ بۆی هەیە بتوێتەوە

**liqueur** (li-kūr′), *n.* جۆرەها خواردنەوەی کحولی بەهێزی مەیلەو شیرینی بۆن و بەرامە خۆشە.

**liquid** (lik′wid), *adj.* (١) شلە؛ شل؛ ڕەوان. (٢) روون (هەوا). (٣) ڕەوان (هۆنراوە): ( *~ verse)* . (٤) بە ئاسانی دەگۆڕێتەوە بە پارەی ڕەق: ( *~ assets)* . (٥) هەمیشە گۆڕاو؛ نەچەسپاو: ( *~ convictions or ideas)* .

*n.* شلە؛ شلەمەندی؛ شلاو.

**liquidate** (lik′wi-dāt′), *v.t.* (١) بڕینەوە (قەرز، بژاردن)؛ پاکتاوکردن. (٢) پاکوپیس کردنی حسابی کۆمپانیایەکی نابووت؛ پاك کردنەوەی حساب. (٣) قەرزدانەوە؛ قەرز پاك کردنەوە. (٤) گۆڕینەوە بە پارەی ڕەق. (٥) کوشتن؛ بنەبڕکردن؛ سەرکردن بە گۆمدا: *( to ~ one's enemies)*

*v.i.* قەرزدانەوە؛ قەرز پاك کردنەوە.

-liquidation *(n.)*.

**liquidator** (lik′wi-dā′tẽr), *n.* بەرپرسیاری بڕینەوەی حسابی کۆمپانیایەکی نابووت، خانووبەرەیەك، یا میراتێیەك.

**liquidity** (li-kwid′ə-ti), *n.* (١) شلەیی؛ شلێتی. (٢) بەگۆڕەی پێویست پارەی ڕەق بەدەستەوەبوون یا سەرمایەی وەها کە بە ئاسانی بگۆڕێتەوە بە پارەی ڕەق.

**liquor** (lik′ẽr), *n.* (١) خواردنەوەی سەرخۆشکەر؛ خواردنەوەی کحولی. (٢) شلە (گۆشتاو، خۆشاو). (٣) دەرمانێکی لە ئاودا گیراوە.

*v.t.* [Slang], [ ~ **up** ], سەرخۆش کردن؛ خواردنەوەی کحولی پێدان.

*v.i.* [Slang], [ ~ **up** ], زۆر خواردنەوە؛ سەرخۆش بوون.

**liquorice** (lik′ẽr-is, lik′ẽr-ish, lik′rish), *n.* = licorice.

**liquorish** (lik′ẽr-ish), *adj.* (١) lickerish . (٢) حەز لە خواردنەوەی کحولی کەر

**lira** (lêr′ɔ), *n.* لیرە: سکەی ئیتالیا و تورکیایە.
**lisp** (lisp), *v.i.* (١) پسەپس کردن؛ بە پسەپس قسەکردن.
(٢) وەك منداڵ قسەکردن
*v.t.* بە پسەپس قسەکردن.
*n.* پسەپسی زمان؛ زمان پسی؛ پسەپس.
**lissome, lissom** (lis′əm), *adj.* (١) جیر؛ نەرم؛ بەکێشمان.
(٢) لەش سووك؛ سووکەڵە؛ خێرا.
**list** (list), *n.* (١) تیلماسکێکی لێکراوە لە قەراغی داگیراوەی قوماش.
(٢) میلی ڕەنگا وڕەنگی قوماش. (٣) پارچە تەختەیەکی باریك و درێژ.
(٤) قەراغ؛ پەراوێز (٥) سەردێراو. (٦) لیستە.
*v.t.* (١) پەراوێز داگرتنەوە؛ پەراوێز گرتن. (٢) میل میل کردن.
(٣) (ا) لیستەگرتن؛ نووسین بە ڕیز. (ب) خستنە لیستەوە؛ نووسین لە لیستەدا.
(٤) زەوی کێڵان و تۆودان لە هەمان کاتدا.
*v.i.* (١) [Rare] . خۆ نووسین بە سەرباز. (٢) زەوی کێڵان.
**list** (list), *v.i.* [Archaic]. (١) بەدڵ بوون؛ پێ ڕازی بوون.
(٢) ویستن؛ هەوەس لێ بوون.
**list** (list), *v.t.* & *v.i.* بەلاداکەوتن (کەشتی)؛ لاربوونەوە.
*n.* لاری؛ لاربوونەوە
**list** (list), *v.t.* & *v.i.* [Archaic], گوێ لێگرتن
**listen** (lis′′n), *v.i.* (١) گوێگرتن
(٢) بەقسەکردن؛ ئامۆژگاری وەرگرتن؛ تەمێ وەرگرتن.
*n.* گوێگرتن
-listener *(n.)*.
**listen in,** گوێ لێگرتن (لە تەلەفۆنی خەڵك، رادیۆ... هتد).
**listening post,** سووسەگا؛ شوێنێکی نهێنییە بۆ گوێگرتن لە دوژمن و سووسە وەرگرتن.
**lister** (lis′tẽr), *n.* هەوجاڕ؛ گاسن.
**listing** (lis′tiŋ), *n.* (١) لیستەگرتن؛ نووسین لە لیستەدا.
(٢) ناوێکی سەر لیستە. (٣) لیستە.
**listless** (list′lis), *adj.* بێ تاقەت؛ لەش داهێزراو؛ سست؛ خاو؛ ماندوو؛ بێ هێز.
**lists** (lists), *n.pl.* (١) پەرژینی یاریگا
(٢) (ا) یاریگا؛ گۆرەپانی ملەملێ. (ب) ملەملێ. (٣) مەیانی جەنگ.
**enter the lists,** چوونە مەیانی ملەملێوە؛ چوونە مەیانی ناکۆکی یا جەنگەوە
**lit** (lit), (1) *alternative past tense and p.p. of* **light.**, (ڕووناك کردنەوە)
(2) *alternative past tense and p.p. of* **light.**, (دابەزین).
**litany** (lit′′n-i), *n.* دوعایەکی جەماوەرییە قەشە دەیخوێنێتەوە و خەڵکی کڵێسەکە بۆی دەسەندنەوە.
**litchi** (lē′chē′), *n.* جۆرە درەختێکی هەمیشە سەوزی چینییە.
**-lite** (līt), *Also* -lyte, پاشگرێکە بەمانای بەرد.
**liter** (lē′tẽr), *n. Also* litre, لیتر.
**literacy** (lit′ẽr-ə-si), *n.* خوێندەواری
**literal** (lit′ẽr-əl), *adj.* (١) تیپی؛ پیتی؛ بە تیپێك دەردەبڕێ (نمرە):
*( a ~ grade)*
(٢) دەقاودەق؛ مانای دەقاودەق؛ مانای ووشە بە ووشە:
*( a ~ translation)*
(٣) (ا) تایبەتی بە مانای ڕێكوڕەوان یەك بە یەك نەك مەجازی:
*( the ~ meaning of a passage)*
(ب) تایبەتی بە مانای بنچینەیی ووشەیەك.
(٤) ووشك (مرۆڤ، مێشك)؛ ئاسا؛ مانای ووشە لێکدەرەوە بەپێی مانای ئاشکرای ووشەکە نەك مەجازی و شاراوە: *( He has a ~ mind.)* .
(٥) سادە؛ ساکار؛ ڕووت؛ نەڕازاوە: *( the ~ truth)* .
-literalness *(n.)*.

**literalism** (lit′ẽr-əl-iz'm), *n.* (١) لێکدانەوەی دەقاودەق؛ لێکدانەوەی ووشە بە ووشە. (٢) دەربڕینی بارێك لە هونەردا بەبێ ڕازاندنەوە و بە شێوەیەکی زۆر نزیك لە ڕاستییەوە.
-literalist *(n.)*; literalistic *(adj.)*.
**literality** (lit´ẽr-al′ə-ti), *n.* (١) دەقاودەقی؛ ووشە بە ووشە.
(٢) مانایەکی ووشە بە ووشەیی یا دەقاودەقی.
**literalize** (lit′ẽr-ə-līz′), *v.t.* (١) گۆڕینی دەقاودەق یا ووشە بە ووشە (لە زمانێکەوە بۆ زمانێك).
(٢) لێکدانەوەی مانای ئاشکرا نەك شاراوە و مەجازی.
**literally** (lit′ẽr-əl-i), *adv.* (١) ووشە بە ووشە؛ دەقاودەق؛ بەبێ ڕازانەوە؛ بەپێی مانای ئاشکرا نەك مەجازی:
*( Translate this passage ~ .)*
(٢) [Colloq.]، بەبێ هیچ پێوەنان؛ بە ڕاستی:
*( He ~ flew into the room.)*
**literary** (lit′ə-rer′i), *adj.* (١) وێژەیی (ئەدەبی):
*( a ~ magazine)*
(٢) (ا) بۆ وێژە شیاو: *( a ~ style)* .
(ب) لە نووسیندا بەکارهێنراو نەك لە دوواندا: *( a ~ language)* .
(٣) وێژەوان؛ شارەزای وێژە؛ ئەدەب خواز؛ وێژەزان: *( a ~ man)* .
(٤) تایبەتی بە نووسەران و پیشەکەیان: *( ~ circles)* .
(٥) ووشك؛ شارەزاییەکەی تەنها لە کتێب خوێندنەوەوە هاتووە.
**literate** (lit′ẽr-it), *adj.* (١) خوێندەوار.
(٢) ڕۆشنبیر؛ زانا؛ تێگەیشتوو
(٣) وێژەوان.
*n.* کەسێکی خوێندەوار، زانا، یا وێژەوان.
**literati** (lit´ə-rā′tī, lit´ə-rä′ti), *n.pl.* (١) نووسەران؛ وێژەوانان؛ بوێژان. (٢) چینی ڕۆشنبیر.
**literatim** (lit´ə-rā′tim), *adv.* = **literally.**
**literature** (lit′ẽr-ə-chẽr, lit′rə-choor′), *n.* (١) وێژە؛ ئەدەب.
(٢) سەرجەمی شتی نووسراو دەربارەی باسێك.
(٣) [Colloq.]، چاپەمەنی (نامیلکە، بڵاونامە، شتی پروپاگەندە).
**-lith** (lith), پاشگرێکە بەمانای: بەرد.
**lithe** (līth), *adj.* جیر؛ نەرم؛ بەکێشمان.
**lithesome** (līth′səm), *adj.* = **lithe.**
**-lithic** (lith′ik), پاشگرێکە بەمانای: تایبەتی بە چەرخێکی تایبەتی بەکارهێنانی بەرد: *(neolithic)* .
**litho-, lith-** (lith′ə), پێشگرێکە بەمانای: بەرد: *(lithograph)* .
**lithograph** (lith′ə-graf´, lith′ə-gräf´), *n.* وێنە یا چاپی لەسەر بەرد کراو.
*v.t.* چاپ کردن یا وێنە دەرهێنان لەسەر بەرد.
-lithographer *(n.)*; lithographic *(adj.)*; lithographically *(adv.)*.
**lithography** (li-thog′rə-fi), *n.* چاپ کردنی بەردی؛ نووسین یا نەخشە و نیگارکێشان لەسەر بەردی ساف و وێنە لەسەر دەرهێنانی.
**lithoid** (lith′oid), *adj.* بەردین؛ بەرد.
**lithotomy** (li-thot′ə-mi), *n.* بەردی ناو میزەڵدان دەرهێنان (نەشتەرکاری).
**lithotrity** (li-thot′ri-ti), *n.* هاڕینی بەردی میزەڵدان (پزیشکەوانی).
**litigable** (lit′i-gə-b'l), *adj.* دەتوانرێ بدرێ بە دادگا.
**litigant** (lit′ə-gənt), *n.* & *adj.* دادخواز؛ داواچی یا داوا لەسەر؛ هەردوو لای داوایەك.
**litigate** (lit′ə-gāt′), *v.t.* & *v.i.* دان بە دادگا؛ داواکاری دان بە دادگا؛ داد خواستن.
**litigation** (lit´ə-gā′shən), *n.* (١) دادخوازی؛ دان بە دادگا؛ ڕەوتی داواکاری لە دادگا. (٢) داواچێتییەك.

**litigious** (li-tij′əs), *adj.* (١) زوو زوو شکاتکەر؛ حەز لە شکاتکەر؛ شەڕەنگێز (٢) لە دادگا دەبڕێتەوە. (٣) تایبەتی بە دادگا.

**litotes** (lī′tə-tēz´), *n.* دەربڕینی شتێك بە پەرچدانەوەی دژەکەی:
***( This is no small problem.; no rare occurence)***

**litter** (lit′ēr), *n.* = **liter.** (١) دەستەبەرەی نەخۆش گواستنەوە.
(٢) پووش و پەڵاشی بەکارهێنراو بۆ ژێرەخەری گیاندار یا داپۆشینی نەمام.
(٣) سکێك: سەرجەمی تووتەڵە سەگ، بەچکە پشیلە، یا بەچکە گیانداری تری بە یەك سك لەدایکبوو: ***( a ~ of puppies)*** .
(٤) زبڵ: شتی پیس‌وپۆخڵ؛ پاشاخوڕ.
(٥) پیس‌وپۆخڵی؛ پیسی؛ ناڕێك‌وپێکی.
(٦) زەمینەی دارستان (کە پووش‌و گەڵاکانی نەختێك گەنیوون).

*v.t.* (١) پووش بۆ کردن بە ژێرەخەر؛ جێ بۆ ئامادەکردن لە پووش:
***( to ~ down a stable, horse, etc.)***
(٢) ترەکین.
(٣) ( ~ up )، پیس‌وپۆخڵ کردن؛ تێکدان بەسەریەکدا:
***( to ~ a deck with papers; to ~ up one's room.)***

*v.i.* ترەکین: زاین (سەگ‌وپشیلە).

**litterateur** (lit´ēr-ə-tũr′), *n.* وێژەوان؛ نووسەر

**litterbug** (lit′ēr-bug´), *n.* شوێنی گشتی پیس‌وپۆخلکەر؛ کەسێکە کە شتی پیس‌وپۆخڵ بە هەموولایەکدا فڕێ دەدات.

**little** (lit″l), *adj.* (١) بچووك؛ بچکۆلە؛ ووردیلە؛ وورد؛ بچکۆلانە.
(٢) کەم: نەخت: تۆز. (٣) کورت (ماوە، دووری، کات)؛ کەم خایەن.
(٤) ناگرنگ؛ بچووك (لە گرنگیدا): ***( the rights of the ~ man)*** .
(٥) کز: کەم هێز: بێ هێز. (٦) بێ بایەخ؛ هیچ‌وپووچ.
(٧) تەسك (مێشك)؛ بچووك؛ نەکراوە: ***( a ~ mind)*** .
(٨) کۆرپە: بەچکە: لاو؛ منداڵ.

***adv.*** (١) کەم: تا ڕادەیەکی کەم؛ نەختێك.
(٢) هیچ ***( He ~ suspects the plot.)*** .

***n.*** (١) کەم ***( L~ will be done about it.)*** .
(٢) ماوەیەکی کورت؛ ماوەیەکی کەم؛ ڕێیەکی کورت.

**little by little,** وورده وورده: بەره بەره؛ نەختە نەختە.

**make little of,** بایەخ پێ نەدان؛ گوێ پێ نەدان؛ بە هیچ دانەنان.

**think little of,** (١) بایەخ پێ نەدان؛ گوێ پێ نەدان؛ بە هیچ دانەنان؛ بە گرنگ دانەنان (٢) ڕاڕایی نەکردن؛ دوو دڵی نەکردن.

**Little Bear,** وورچی بچکۆلە: کۆ ئەستێرەیەکە؛ حەوتەوانە بچووك.

**little finger,** پەنجە تووتە

**liturgical** (li-tũr′ji-k'l), *adj.* تایبەتی بە نەریتی نوێژو دۆعا لە کڵێسەدا

**liturgics** (li-tũr′jiks), *n.pl.* زانستی نوێژو دۆعای جەماوەری؛ لێکۆڵینەوەی نەریتی ئاینی.

**liturgist** (lit′ēr-jist), *n.* (١) لایەنگری نەریتی ئاینی لە کڵێسەدا.
(٢) نەریتی ئاینی ناس؛ زانای نەریتی ئاینی کڵێسە.

**liturgy** (lit′ĕr-ji), *n.* شێوەی خوداپەرستی لە کڵێسەدا؛ نەریتی ئاینی لە کڵێسەدا بەتایبەتی هی نوێژو دۆعا.

**livable, liveable** (liv′ə-b'l), *adj.* (١) بۆ تێد: ژیان باشە (خانوو، ژوور)؛ بەکاری تێدا ژیان دێت. (٢) دەردەبرێ (ژیان، بارێکی تایبەتی ژیان)؛ لەگەڵی دەردەبرێ؛ بەرگەی دەگیرێ (ناخۆشی ژیان).
(٢) لەگەڵی هەڵدەکرێت (مرۆڤ)؛ ژیان لەگەڵیدا دەردەبرێ.

**live** (liv), *v.i.* (١) ژین: ژیان.
(٢) مانەوە: هەڵکردن؛ دەربردن.
(٣) بە جۆرێکی تایبەتی ژیان بردنە سەر.
(٤) بە خۆشی‌و پڕ ئاسوودەیی ژیان: ***( They ~.)*** .
(٥) خۆ ژیاندن؛ ژیان لەسەر؛ پێ چوون بەڕێوە:
***( She ~s on fifty dollars a week.)***
(٦) پێ ژیان: ***( Bats ~ on insects and fruit.)*** .
(٧) نیشتەنی بوون؛ دانیشتن؛ ژیان: ***( He ~s in England.)***
(٨) لە یادا مانەوە.

*v.t.* (١) بە کردەوە کردن: ***( He ~s his faith.)*** .
(٢) بردنەسەر: ***( She ~ed a useful life.)*** .

**live and let live,** لێبووردن هەبوون؛ بژی‌و بهێڵە خەڵکیش بژی.

**live down,** (١) سڕینەوەی کردارێکی ناپەسەند بە ژیانی پاك.
(٢) زاڵبوون بەسەر شەرمەزارییەکدا بە ڕێبازی ڕاست گرتن.

**live high,** بە خۆش گوزەرانی‌و ئاسوودەیی ژیان.

**live in,** لەگەڵ خاوەن ماڵەکە دەژی (کارەکەر).

**live it up,** [Colloq.], زۆر خۆش ڕابواردن.

**live through,** دەربردن؛ هەڵکردن:
***( to live through a frightening experience.)***

**live up to,** (١) بەگوێرەی بیروباوەڕ یا پەیڕەوێك ژیان؛ پەیڕەوی کردن:
***( to live up to certain ideals)***
(٢) هێنانەدی ئەوەی چاوەڕوان دەکرێ؛ کردنی کاری چاوەڕوان کراو:
***( to live up to a great reputation)***

**live with,** (١) لەگەڵدا ژیان. (٢) هاوسەری کردن.

**live** (līv), *adj.* (١) زیندوو. (٢) چالاك؛ ووریا؛ زیت.
(٣) گەرم: ***( a ~ political issue)*** .
(٤) گڕدار؛ دانەمرکاوە: ***( a ~ spark)*** .
(٥) دانەگیرساو: نەسووتاو؛ زیندوو: ***( a ~ match)*** .
(٦) گەرم؛ زیندوو (تەقەمەنی)؛ ڕاستەقینە: ***( ~ ammunition)*** .
(٧) نەتەقیو؛ زیندوو: ***( a ~ shell)*** .
(٨) گەش؛ بریقەدار؛ تێر (ڕەنگ): ***( ~ colors)*** .
(٩) گەرم (تەل کارەبا)؛ کارەبای لەسەرە: ***( a ~ wire)*** .
(١٠) پڕ لە خەڵك؛ جمەی دێت.
(١١) پاك (هەوا).
(١٢) ڕاستەوخۆ (ئاهەنگ، کۆڕ، بەرنامە...هتد): ***( a ~ concert)*** .

**liveable** (liv′ə-b'l), *adj.* = **livable.**

**livelihood** (līv′li-hood´), *n.* بژێو؛ گوزەران؛ دەرامەت.

**lively** (līv′li), *adj.* (١) [Rare] ، ژیان ئاسا
(٢) چالاك؛ زیت؛ بزۆك؛ بەتین
(٣) گەرم (کۆڕ)؛ بەجۆش ***( a ~ session of the council)*** .
(٤) بەکەیف؛ زیندوو.
(٥) گورج‌وگۆڵ؛ خێرا.
(٦) توند (با، سروە): ***( a ~ breeze)*** .
(٧) ڕوون؛ گەش؛ بەشەوق: ***( ~ colors)*** .

*adv.* بە چالاکی؛ بە تینەوە؛ بە گورج‌وگۆڵی.

**-livelily *(adv.)*; liveliness *(n.)*.**

**liven** (līv′ən), *v.t.* ( ~ **up** ), جۆش تێخستن؛ گەرم کردن (کۆڕ، ئاهەنگ).

*v.i.* ( ~ **up** ). جۆش سەندن؛ جۆش تێکەوتن؛ گەرم بوون.

**live oak,** داربەڕوویەکی هەمیشە سەوزی دار سەختی ئەمەریکاییە.

**liver** (liv′ĕr), *n.* (١) جگەر؛ جەرگ. (٢) کانگەی هەست‌و ئارەزوو.

**liverish** (liv′ēr-ish), *adj.* [Colloq.], (١) جگەری نەخۆشە.
(٢) تەنگەجیکڵانە؛ تووڕە‌وتڕۆ.

**liverwort** (liv′ēr-wũrt´), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکی ڕەنگاوڕەنگن لە قەوزە دەچن.

**livery** (liv′ēr-i), *n.* (١) بەرگی تایبەتی (وەك هی بەردەستان یا پیشەیەکی تایبەتی). (٢) ئەوانەی ئەم بەرگە تایبەتییە لەبەر دەکەن.
(٣) ڕاگرتن‌و بەخێوکردنی ئەسپ بۆ خاوەنەکەی بە کرێ.
(٤) ڕاگرتنی ئەسپ‌و گالیسکە بۆ بەکرێدان.
(٥) تەویلەی ئەسپی کرێ؛ خان.
(٦) دانی خانوو زەوی‌وزار بە خاوەنی تازەی.

**liveryman** (liv′ēr-i-mən), *n.* (١) بەردەست؛ ڕەنجبەر؛ پیاو.

(۲) پیشەچییەکی شاری لەندەن.
(۳) خانچی: مەیتەر (کە لە تەویلەی ئەسپی کرێدا کاردەکات).
**livery stable,** تەویلەی ئەسپ و گالیسکەی کرێ؛
تەویلەی ئەسپ بەخێوکردن بۆ خاوەنەکەی بە کرێ
**lives** (līvz), *n. plural of* life.
**livestock** (līv′stok′), *n.* مەڕومالات: ئاژەڵ
**live wire,** (۱) تەلی کارەبای گەرم؛ تەلی کارەبا لەسەر.
(۲) [Colloq.]. کەسێکی زیت و وریا و چالاک.
**livid** (liv′id), *adj.* (۱) شین بووەوە (پێست، گۆشت)؛ شین.
(۲) ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاو (لە تووڕەییدا یا بە نەخۆشی): *( ~ with rage)* .
(۳) زۆر تووڕە
-lividity *(n.)*; lividness *(n.)*; lividly *(adv.)*.
**living** (liv′iŋ), *adj.* (۱) زیندوو.
(۲) چالاک؛ بەتین؛ بەکار: *( a ~ institution)* .
(۳) تایبەتی بەوانەی زیندوون: *( withing ~ memory)* .
(٤) ئاوی لەبەر دەڕوات؛ ڕەوان: *( a ~ stream)* .
(٥) زیندوو (زمان): هێشتا قسەی پێ دەکرێت *( a ~ language)* .
(٦) ڕاستەقینە: دەقاودەق *( the ~ image)* .
(۷) (ا) تایبەتی بە ژیان؛ ژیان: *( ~ conditions)*
(ب) بەشی ژیانێکی مام ناوەندی دەکات *( a ~ wage)* .
*n.* (۱) ژیان؛ ژین؛ زیندوویێتی.
(۲) گوزەران؛ بژێوی *( He must work for a ~ .)*
(۳) شێوە یا پەیەی ژیان *( a higher standard of ~ )* .
(٤) زەوی‌وزارێکی بە کڵێسە بەخشراو (کە بەروبوومەکەی قەشەی پێ دەژی).
the living, زیندووان؛ ئەوانەی زیندوون
**living death,** ژیانێکی تاڵ و ناخۆش
**living room,** ژووری میوان؛ ژووری دانیشتن؛ دیوەخان.
(پێشی دەوترێ: " parlor " و " sitting room ").
**living wage,** مووچەیەك کە بەشی ژیانێکی مام ناوەندی بکات.
**lixiviate** (lik-siv′i-āt′), *v.t.* پاڵاوتن (بە کوڵاندن)
-lixiviation *(n.)*.
**lizard** (liz′ẽrd), *n.* مارمێلکە؛ شەوگەڕ؛ قۆزی.
**llama** (lä′mə), *n.* لامە: گیاندارێکی ئەمەریکای باشوورە لە توخمی حوشترە بەڵام بچووکترە و کۆپارەی نییە بۆ بارکێشان بەکاردێت و گۆشت و شیرەکەیشی دەخورێت.
**lo** (lō), *interj.* سەیرکە؛ تەماشاکە: *( ~ and behold!)* .
**loach** (lōch), *n.* ماسییەکی ئاو ڕووبارە
**load** (lōd), *n.* (۱) بار؛ بارگە؛ کۆڵ.
(۲) پێوانە یا سەنگێکی تایبەتی: *( a ~ of wood)*
(۳) (ا) بارێکی قورس
(ب) بارێکی قورس بە مێشکەوە یا بە کۆڵەوە؛ ئەرك
*( That's a ~ off my mind.)*
(٤) داگرتنەوە (چەکی ئاگرین).
(٥) [Colloq.] زۆر؛ فرە؛ ئێجگار زۆر. *( She has ~s of friends.)* .
(٦) ئەرکی مامۆستا *( a heavy teaching ~ )* .
(۷) تەووژمی کارەبا
*v.t.* (۱) پڕکردن؛ ئاخنین: *( They ~ed the sacks with wheat.)* .
(۲) بارکردن؛ بارلێنان؛ خستنەسەر
*( They ~ed the boxes on the truck.)*
(۳) باری قورس لێنان؛ پساندن؛ ئەرکی زۆر خستنە سەرشان.
(٤) زۆر پێدان *( They ~ed him with honors.)* .
(٥) داگرتنەوە (چەکی ئاگرین)؛ گوللە تێخستن؛ فیشەك تێخستن:
*( to ~ a gun)*
(٦) فیلم خستنە کامێراوە: *( to ~ a camera)* .
(۷) ناپوختەکردن؛ ڕوونکردنەوە: *( They ~ed the wine.)* .
(۸) پرسیارکردن بە جۆرێك کە ئەو وەڵامەی مەبەستە بیدرێتەوە.
*v.i.* (۱) گوللە تێخستن؛ داگرتنەوە. (۲) داگیرانەوە؛ تەقەمەنی تێخران.
**loaded** (lōd′id), *adj.* (۱) بارکراو؛ باری پێوەیە.
(۲) داگیراوە؛ پڕ گوللە؛ پڕ. (۳) [Slang]، سەرخۆش.
(٤) [Slang]، دەوڵەمەند؛ پارەدار.
**loaf** (lōf), *n.* (۱) کولێرە؛ خەپلە؛ لەواشە نان: *( a ~ of bread)* .
(۲) کێکێکی گەورە.
(۳) تەبەقێك خواردەمەنی: *( a salmon ~ )* .
(٤) کەللە شەکر.
**loaf** (lōf), *v.i.* (۱) سووڕانەوە؛ ئیش نەکردن؛ خۆلستنەوە؛ جادەپێوان.
(۲) کات بەفیڕۆدان لەسەر ئیش؛ خۆ خەریك کردن لەسەر کار.
*v.t.* ( ~ away ), کات کوشتن؛ کات بەفیڕۆدان؛ سووڕانەوە.
**loafer** (lōf′ẽr), *n.* (۱) کەسێکی بێ ئیش‌وکار؛ کەسێکی کارنەکەر.
(۲) پێڵاوێکە لە نەعل دەچێ.
**loam** (lōm), *n.* (۱) خاکی لە خۆڵ و لم و لیتە و زیندە مادده پێکهاتوو.
(۲) قوڕی شێلراو (بۆ خشتکاری).
*v.t.* خشت درووستکردن بەم قوڕە؛ درز پڕکردنەوە بەم قوڕە.
**loan** (lōn), *n.* (۱) قەرز (بەتایبەتی کە سوودی لەسەر بدرێ):
*( to get a ~ ; to take out a ~ ; to give a ~ )*
(۲) خواستەمەنی؛ دەستەوا.
(۳) قەرزپێدان؛ دەستگیرۆیی؛ پێدان بە ئەمانەت.
*v.t. & v.i.* (۱) بە ئەمانەت پێدان.
(۲) بە قەرز پێدان؛ قەرزپێدان بە قازانج.
**loan shark,** [Colloq.], سووخۆر؛ زۆر سوو خۆر (بەتایبەتی هی قەدەغە).
**loan word,** ووشەی خواستراو (لە زمانێکی ترەوە و کراو بە هی خۆ):
(وەك ئەم ووشانە لە فەرەنسی و ئەڵمانییەوە):
encore, kindergarten, hors d'oeuvre
**loath** (lōth), *adj.* نابەدل: *( They were ~ to depart.)* .
**loathe** (lō*th*), *v.t.* زۆر ڕق لێ بوون؛ بێزلێهاتنەوە؛ حەز لە چارە نەکردن.
**loathful** (lō*th*′fəl), *adj.* [Rare], = loathsome.
**loathing** (lō*th*′iŋ), *n.* زۆر ڕق لێ بوون؛ زۆر قێزلێهاتنەوە.
**loathsome** (lō*th*′səm), *adj.* بۆگەن؛ پیس؛ شایستەی ڕق لێ بوون و قێزلێهاتنەوەیە: *( a ~ person, act, etc.)* .
**loaves** (lōvz), *n. plural of* loaf.
**lob** (lob), *n.* (۱) [Dial.]، کەسێکی زل حۆل سست.
(۲) تۆپ لێدانێك کە دەچێ بە هەوادا و لە پشتەوەی یاریگای بەرامبەردا دەگیرسێتەوە (یاری تەنس).
*v.t.* لێدانی تۆپی تەنس بەم جۆرە.
*v.i.* ( ~ along ), (۱) بە سستی و ناقۆڵایی جووڵانەوە.
(۲) لێدانی تۆپی تەنس بە هەوادا.
**lobar** (lō′bẽr), *adj.* پەڕەیی (وەك هی سییەکان): *( ~ pneumonia)* .
**lobby** (lob′i), *n.* (۱) ساڵۆنی چاوەڕێ کردن و حەوانەوە (ئوتێل، فەرمانگە). (۲) ساڵۆنێکی گەورەیە لە تەنیشت هۆڵی پەرلەمانی ئاوچەوە (کراوەتەوە بۆ خەڵك). (۳) دەستەی پروپاگەندەکەران لەلای پەرلەمان (بۆ سەرخستن یا ژێرخستنی مەسەلەیەك): *( the tobacco ~ )* .
*v.i. & v.t.* پروپاگەندە کردن لەلای پەرلەمان و ئەندامەکانی (بۆ سەرخستن یا ژێرخستنی مەسەلەیەك): *( to ~ for a cause)* .
**lobbyist** (lob′i-ist), *n.* پروپاگەندەکەر لای پەرلەمان (بۆ دەنگدان لەسەر مەسەلەیەك و سەرخستنی).
**lobe** (lōb), *n.* (۱) نەرمە گۆشتەی گوێ.
(۲) پەڕە (دڵ، سی، جگەر، مێشك)؛ لۆ؛ خانە:
*( the ~ of the brain, lung, or liver)*
(۳) خانەی گەڵا.
**lobectomy** (lō-bek′tə-mi), *n.* لێکردنەوەی پەڕەیەکی سی، جگەر،

مێشك . هتد. به نەشتەرگاری.
**loblolly** (lob′lol′i), *n.* (١) [Obs.]، شۆربای خەست.
(٢) [Colloq.]، کەسێکی زلحۆی کەر.
(٣) [Colloq.]، چاڵێکی قوڕاوی.
**lobo** (lō′bō), *n.* جۆرە گورگێکی گەورەیە.
**lobotomy** (lō-bot′ə-mi), *n.* لابردنی هەندێ پەڕەی مێشك به نەشتەرکاری (کە دەبێتە هۆی هەست نەمانی نەخۆشەکە).
**lobster** (lob′stēr), *n.* کوللەی دەریا
**lobule** (lob′ūl), *n.* لۆ بچکۆلە؛ لۆ؛ پەڕە چکۆلە (مێشك، سی، جگەر).
-lobular *(adj.)*.
**local** (lō′k'l), *adj.* (١) تایبەتی بە شوێنێك یا ناوچەیەك.
(٢) ناوخۆ؛ ناوخۆیی؛ خۆماڵی: ***(~ government)*** .
(٣) تەسك: ***(~ outlook)*** .
(٤) تایبەتی بە ئەندامێکی لەش نەك هەمووی: ***(~ anesthesia)*** .
(٥) ناوخۆ (شەمەندەفەر، پاس)؛ لە گەلێك شوێن دەوەستێت؛ هی ناوشار:
***( a ~ train)***
***n.*** (١) شەمەندەفەر یا پاسی ناوخۆ (کە لە گەلێك شوێن دەوەستێت).
(٢) لقی ڕێکخراوێك (بەتایبەتی یەکێتی کرێکاران).
(٣) کەسێکی خۆجێیی.
**local color,** خوونەریت و تایبەخۆی ناوچەیەك (کە نووسەرێك لە چیرۆك یا شانۆنامەیەکدا باسی دەکات بۆ نزیك کردنەوەی لە خوێنەران).
**locale** (lō-kal′, lō-käl′), *n.* (١) شوێن؛ جێ (بەتایبەتی جێگەی ڕووداوێك). (٢) شوێن یا دەوروبەری چیرۆکێك (وێژە).
**local government,** فەرمانڕەوایی ناوخۆ.
**localism** (lō-k'l-iz'm), *n.* (١) خوو نەریتی ناوچەیی
(٢) ووشە یا ووتەیەکی تایبەتی بە ناوچەیەك.
(٣) حەز لە ناوچەیەکی تایبەتی کردن؛ بەسترانەوە بە ناوچەیەکەوە.
(٤) بیروڕا تەسکی؛ مێشك تەسکی و لە چاوی ناوچەیەکی تەسکەوە شت بینین.
**locality** (lō-kal′ə-ti), *n.* شوێن؛ ناوچە؛ گەڕەك.
**localize** (lō′k'l-īz′), *v.t.* (١) تایبەتی کردن بە شوێنێك.
(٢) لە ناوچەیەکدا هێشتنەوە و ڕێی پەرەسەندن لێ گرتن.
(٣) سەرچاوە دۆزینەوە؛ گەڕانەوە بۆ شوێنی لێوە هەڵقوڵانی یا پەیدابوونی:
***( to ~ a dialect)***
***v.i.*** لە یەك شوێندا جێگیربوون.
**locally** (lō′k'l-i), *adv.* لە شوێنێکی تایبەتیدا؛ لە ناوخۆدا؛ لەو ناوچەیەدا:
***( The tornado did much damage ~ .;***
***You can't find any good honey ~ .)***
**locate** (lō′kāt, lō-kāt′), *v.t.* (١) شوێن دیاری کردن.
(٢) کەوتنە شوێنێکەوە؛ لە شوێنێکدا بوون:
***( His offices are ~d on the third floor.)***
(٣) دۆزینەوەی شوێنەکەی: ***( He ~d the seat of the trouble.)*** .
(٤) پیشاندان (شوێن)؛ پەنجە خستنەسەر شوێنەکەی:
***( L~ Istanbul for me on this map.)***
(٥) دانان لەسەر کارێك یا لە شوێنێکدا.
***v.i.*** [Colloq.], جێنشین بوون: ***( He ~d in New York.)*** .
**location** (lō-kā′shən), *n.* (١) جێ دیاری کردن؛ شوێن دیاری کران.
(٢) شوێن؛ جێ؛ هەوارگە.
(٣) شوێن یا ناوچەیەکی دیاریکراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی.
(٤) شوێنێکە لە دەرەوەی ستۆدیۆ کە فیلمی تێدا دەگیرێ.
**locative** (lok′ə-tiv), *adj.* تایبەتی بە باری ناوی شوێن دەربڕ (ڕێزمان).
***n.*** (١) باری ناوی شوێن پیشاندەر (ڕێزمان).
(٢) ناوێکە کە لەم بارەدا بێ.
**loc. cit.,** [L.], لە هەمان شوێنی ناوبراودا (پەراوێز).
**loch** (lok, lokh), *n.* [Scot.], دەریاچە
**lock** (lok), *n.* (١) قفل (٢) داخستن؛ قفلدان.
(٣) بەشێکی داخراوی جۆگە ئاوێك کە بەلەمی تێدا بەرزو نزم دەکرێتەوە بەهۆی دەرگای بزۆکەوە.
(٤) چەخماخێکە تفەنگی کۆنی پێ ئاگر دەدرا.
(٥) دەست لەیەك گیربوون (زۆرانبازی)؛ گرتن؛ بەیەکداچوون (دەست و لاق).
***v.t.*** (١) قفلدان (دەرگا، جانتا، سنووق)؛ داخستن.
(٢) بەندکردن؛ ڕاگرتن؛ قەتیس کردن: ***( He was ~ed in the closet.)***
(٣) بەیەکداکردن (قۆڵ)؛ لە یەك هەڵکێشان: ***( We ~ed arms.)*** .
(٤) بە توند باوەش پێداکردن.
(٥) کلیلەبوون؛ گیرخواردن لەناو یەکتردا: ***( The gears are ~ed.)*** .
(٦) دەرگای بزۆك دانان لە جۆگە ئاوێکدا
(٧) هێنان و بردنی بەلەم بە جۆگە ئاوێکدا بە هۆی دەرگا یا بەستی بزۆکەوە
***v.i.*** (١) قفلدران؛ داخران (٢) لەیەك گیربوون؛ بەیەکداچوون؛ چوون بەناو یەکتردا؛ بوون بە یەك؛ جووت بوون؛ لەیەکدان.
(٣) چوونە کلیلە؛ کلیلەبوون (دەم): ***( His jaws ~ed.)*** .
(٤) گیرخواردن و نەجوولان (گێڕی مەکینە).
lock away, هەڵگرتن لە دەفر یا سنووقێکی قفل لێدراودا.
lock horns, تێوەگلان؛ دەستەویەخە وەستان؛ شاخ لە شاخ گیرکردن (شەڕەقۆچی بەران و خرت).
lock in, دەرگای ژوور لەسەر داخستن و ڕێی هاتنە دەرەوە نەدان.
lock out, (١) دەرگا لەسەر داخستن و ڕێی هاتنەژوورەوە نەدان.
(٢) دەرگای کارخانە داخستن و ڕێی کرێکار نەدان بە چوونەژوورەوە (بۆ سەپاندنی مەرجی خاوەن کارەکە بە سەریاندا).
lock up, (١) قفل لێدان (دەرگای ماڵ)؛ داخستن بە قفل.
(٢) هەڵگرتن لە دەفرێکی قفل لێدراودا. (٣) خستنە بەندیخانەوە؛ بەندکردن
under lock and key, لە دەفرێکی قفل لێدراودا هەڵگیراوە.
**lock** (lok), *n.* (١) کاکۆڵ؛ پرچی لوول؛ تیتك؛ ئەگریجە.
(٢) (*pl.*) [Poetic]، پرچ؛ قژی سەر؛ قژ. (٣) تۆپەڵە خوری یا لۆکە
**locker** (lok′ēr), *n.* (١) قفل لێدەر
(٢) دۆڵاب (بەتایبەتی لە ژووری خۆگۆڕینی وەرزشکاردا بۆ تێخستنی شتی بەنرخ و قفل لێدانی)؛ چەکمەج. (٣) دۆڵابی خواردن (لە کەشتیدا).
**locker room,** ژووری خۆگۆڕینی وەرزشکار (کە چەند دۆڵابێکی تێدایە بۆ جل و شتی بەنرخ تێدادانان و قفلدانی).
**locket** (lok′it), *n.* قوتویەکی بچکۆلەی جوانە تۆپەڵە قژ، وێنە، یا شتی تری تێ دەخرێ و بە زنجیر دەکرێ بە ملدا.
**lockjaw** (lok′jô′), *n.* کلیلەبوونی دەم (دەردەکۆپان).
**locksmith** (lok′smith′), *n.* قفلچی؛ قفل و کلیل دروستکەر.
**lock-up** (lok′up′), *n.* (١) داخستن؛ قفلدان؛ داخران.
(٢) خرانە بەندیخانەوە؛ بەندکران. (٣) بەندیخانە.
**loco** (lō′kō), *n.* (١) **locoweed** . (٢) **loco disease** .
***v.t.*** (١) دەرمانخوارد کردن بە ڕووەکی شێتی. (٢) [Slang]، شێت کردن.
***adj.*** [Slang], شێت؛ مێشك تێکچوو.
**loco-** (lō′kō, lō′kə), پێشگرێکە بەمانای: لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر.
**loco disease,** شێتی ئاژەڵ و ئەسپ: نەخۆشییەکی شێتییە تووشی ئاژەڵ و ئەسپ دەبێ بەهۆی خواردنی " ڕووەکی شێتی " یەوە.
**locoism** (lō′kə-iz'm), *n.* = loco disease.
**locomotion** (lō′kə-mō′shən), *n.* بزوان لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر: ***( Walking is a form of a ~ .)***
**locomotive** (lō′kə-mō′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە بزوان لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر. (٢) بزۆك
(٣) تایبەتی بە مەکینەی بزۆك یا خۆبزوێن.
***n.*** مەکینەی خۆبزوێن (بەتایبەتی هی شەمەندەفەر)؛ مەکینەی بزۆك.
**locomotor** (lō′kə-mō′tēr), *n.* خۆبزوێن (مرۆڤ، مەکینە).
***adj.*** هی بزوان.
**locoweed** (lō′kō-wēd′), *n.* ڕووەکی شێتی: ڕووەکێکە ئاژەڵ و

ئەسپ پێی شێت دەبێ ئەگەر بیخوێ.

**locus** (lō′kəs), *n.* (١) جێ؛ شوێن؛ جێگە.
(٢) ڕوو (ئەندازە)؛ هێڵ؛ جێ (ئەندازە).

**locust** (lō′kəst), *n.* (١) کوللە
(٢) مێرووێەکی دەنگ زلە لە کوللە دەچێت.
(٣) دارخرنووک؛ خرنووک. (٤) درەختێکی ئەمەریکاییە.
(٥) دارو تەختەی ئەم درەختە.

**locution** (lō-kū′shən), *n.* (١) ووتە؛ ووشە
(٢) شێوەیەکی تایبەتی دووان.

**locutory** (lok′yoo-tôr′i, lok′yoo-tō′ri), *n.* ژووری دەمەتەقێ (وەك لە خەڵوەتگایەکی ئاینیدا).

**lode** (lōd), *n.* (١) (أ) دەماری کانزایی (ب) پارچە کانزای خاو
(٢) سەرچاوەی لەبن نەهاتووی ئازووقە.

**lodestone** (lōd′stōn′), *n.* (١) بەردی ئاسنکێش.
(٢) ڕاکێشەر.

**lodge** (loj), *n.* (١) کوختەی دوور لە ئاوەدانی؛ کوختە؛ خانوو:
*( a skiing ~ )*
(٢) کوختەی بەردەست؛ کوختەی پاسەوان.
(٣) ئوتێل؛ خان
(٤) (أ) دەواری هیندی ئەمەریکایی. (ب) کۆمەڵێکی دەوارنشینی وەها.
(٥) (أ) لقی هەندێ ڕێکخراو. (ب) شوێنی کۆبوونەوەی لقێکی وەها.
(ج) کۆڕی لقێکی وەها
(٦) لانە (وەك هی گۆڕ هەڵکەنە).

*v.t.* (١) حەواندنەوەی سەردەمی؛ جێی نووستن پێدانی سەردەمی؛ جێکردنەوە.
(٢) ژوور پێدان بە کرێ.
(٣) دامەزراندن؛ جێکردنەوە؛ لانەپێدان؛ دانان:
*( to ~ children with relatives)*
(٤) دانان؛ خستنەناو بە ئەمانەت.
(٥) پیاکردن؛ تیا چەسپاندن؛ پێوەنان (گوللە، تیر)؛ تیا گیرساندنەوە:
*( He ~d a bullet in the deer's back.)*
(٦) شکات کردن؛ دان بە دادگا: *( to ~ a complaint)* .
(٧) دەسەلات پێدان.
(٨) خستن (دانەوێڵەی نەدووراوە).

*v.i.* (١) تێدا ژیان (بۆ سەردەمێك)؛ نیشتەنی بوون بۆ ماوەیەك:
*( They ~d in the same house for a while.)*
(٢) بە کرێ گرتن (بەتایبەتی ژوورێك لە ماڵی کەسێکدا).
(٣) چوونەناو بۆ حەوانەوە؛ کردن بە لانەی سەردەمی
(٤) تێدا چەسپان؛ جێگیربوون؛ جێی خۆ گرتن؛ تێدا گیرسانەوە:
*( The bullet ~d in his leg.)*

**lodger** (loj′ēr), *n.* کرێچی ژووری ماڵێك
*( The widow makes a living by taking in ~s.)*

**lodging** (loj′iŋ), *n.* (١) ماڵ یا لانەی سەردەمی؛ نشینگەی سەردەمی.
(٢) جێی نووستن؛ جێی حەوانەوە.
(٣) (*pl.*) ژوورێك یا چەند ژوورێکی بە کرێ گیراو لە ماڵێکدا؛ ژووری کرێ گرتە.
(٤) حەواندنەوە؛ لانەپێدان؛ جێکردنەوە.

**lodging house,** خانوویەك یا ماڵێکی ژوور بە ژوور بە کرێدراو

**lodgment** (loj′mənt), *n. Also* **lodgement,** (١) جێکردنەوە؛ لانە یا نشینگەی سەردەمی پەیداکردن.
(٢) لانە؛ نشینگە؛ ماڵ یا جێی حەوانەوەی سەردەمی
(٣) کۆمەڵەبوون؛ کەڵەکەبوون و ڕێکگرتن
(٤) ناوچەی گیراوی خاکی دوژمن لە جەنگدا؛ بنکەیەکی سوپاییە لەناو خاکی دوژمندا.

**loft** (lôft, loft), *n.* (١) ژووروچکەیەکی بەربەرەڵایە لەژێر بنمیچی ژوورێکی بەرزدا
(٢) ژووروچکەیەکی وەها لە عەمارێك یا ژوورێکی پیشەسازی گەورەدا.
(٣) باڵکۆن یا سەکۆ (وەك لە کلێسەیەکدا): *( a choir ~ )* .
(٤) کایەن؛ ژووروچکەیەکی بنمیچی تەوێلەیە بۆ کا و گزرە.
(٥) (أ) کولانە کۆتر. (ب) کۆتری ناو کولانەیەکی وەها.
(٦) (أ) خوارکردنەوەی سەری گورزی یاری " گۆڵف " (بۆ لێدانی تۆپەکە بە هەوادا). (ب) لێدانی تۆپی یاری " گۆڵف " بە هەوادا.

*v.t.* (١) دانان یا هەڵگرتن لە ژووروچکەی بنمیچدا.
(٢) (أ) لێدانی تۆپی یاری " گۆڵف " بە هەوادا.
(ب) لارکردنەوەی دەمی گورزی یاری " گۆڵف " بۆ لێدانی تۆپ بە هەوادا.

**lofty** (lôf′ti, lof′ti), *adj.* (١) بەرز (لووتکە)؛ بڵند؛ زۆر بەرز:
*( a ~ peak in the Alps)*
(٢) بەرزو نایاب؛ بڵند (پلە، شێوان)؛ بەشکۆ:
*( ~ aims, ideals, sentiments, style, etc.)*
(٣) لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ کەشخەچی: *( in a ~ manner)* .
-loftily *(adv.)*; **loftiness** *(n.)*.

**log** (lôg, log), *n.* (١) (أ) بڕەدار؛ لقەدار؛ کۆتەرەدار؛ موورەدار؛ داری سووتان. (ب) دارو دەستەك؛ داری خانووسازی.
(٢) پێوانەی خێرایی کەشتی.
(٣) تۆمارنامەی ڕۆژانەی کەشتی (دەربارەی خێرایی و جێگەو ڕوودان)
(٤) (أ) تۆمارنامەی کاری ڕۆژانەی فڕۆکە یا مەکینەکەی.
(ب) تۆمارنامەی کاتی فڕین و شارەزایی فڕۆکەوان.
(٥) تۆمارنامەی گەشتێك؛ کارنامە.

*adj.* لە موورەدار یا دارودەستەك دروستکراو: *( a ~ cabin)* .

*v.t.* (١) (أ) دار بڕینەوە. (ب) دارو درەخت بڕینەوەو گواستنەوەی بۆ کارخانە.
(٢) تۆمارکردن لە تۆمارنامەی کەشتی یا فڕۆکەدا.
(٣) بڕینی ماوەیەك بە کەشتی.
(٤) کار بۆ کردن؛ تۆمارکردنی کاتی کارکردن:
*( He has ~ged 25 years with his company.)*

*v.i.* دارو درەخت بڕینەوەو گواستنەوە.

**log,** - **logarithm.**

**logarithm** (lôg′ə-rith′m, log′ə-rith′m), *n.* لۆگاریسم.
-logarithmic *(adj.)*; **logarithimcally** *(adv.)*.

**logbook** (lôg′book′, log′book′), *n.* تۆمارنامەی کاری ڕۆژانەی کەشتی و فڕۆکە.

**logger** (lôg′ēr, log′ēr), *n.* (١) دارکەر؛ ئەوەی دارودرەخت دەبڕێتەوە؛ دارو تەختە بڕەوە. (٢) ئامێری بارکردنی دارو تەختەو دەستەك لەسەر لۆری

**loggerhead** (lôg′ēr-hed′, log′ēr-hed′), *n.* (١) کەسێکی کەرو بێ مێشك. (٢) شیشێکی سەر خڕە سەرەکەی گەرم دەکرێت و قیری پێ دەتوێنرێتەوە یا شلەی پێ گەرم دەکرێت.
(٣) جۆرە کیسەڵێکی ئاوی سەر زل قاوغ ڕەقە.
(٤) سنگێکە لەسەر بەلەمی ڕاوە نەهەنگ ئەو گوریسەی تێوە دەپێچرێت کە نەهەنگی ڕاوکراوی پێ ڕادەکێشرێت.

**at loggerheads ( with ),** ناکۆکن؛ شەڕیانە؛ زۆر ناڕێکن.

**loggia** (loj′i-ə, lô′jə), *n.* (١) ڕاڕەوێکی تاق تاقی سەرگیراوە بەسەر حەوشەیەکی بەر بەرەڵادا دەڕوانێ. (٢) باڵکۆن (شانۆ یا سینەما).

**logging** (lôg′iŋ, log′iŋ), *n.* دارو درەخت بڕینەوەو گواستنەوەیان بۆ کارخانە.

**logic** (loj′ik), *n.* (١) ژیربێژی؛ زانستی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی دروست و بەجێ. (٢) پەرتووکی ژیربێژی.
(٣) بیرکردنەوەی ڕاست و دروست؛ لێکدانەوەی ڕاست:
*( L~ shows us a better course.)*
(٤) شێوەی بیرکردنەوەو لێکدانەوە (ڕاست بێ یا هەڵە):
*( At this point our ~ was at fault.)*
(٥) بنچینەکانی زانستێك یا هونەرێك.
(٦) پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام.

**logical** (loj′i-k′l), *adj.* (١) تایبەتی بە ژیربێژی؛ ژیربێژەکی.

# M m

**M, m** (em), *n.* (١) تیپی سیانزەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " ئێم " . (٣) قاڵبی ئەم تیپە.
(٤) نیشانەی سیانزەهەم لە ڕیزێکدا؛ نیشانەی پلەی سیانزەهەم.
(٥) ئەم تیپە بە چاپکراوی.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی M . (٢) سیانزەهەم.
**M** (em), *n.* (١) شتێك لە شێوەی M دا.
(٢) ژمارە هەزاری ڕۆمانی.
*adj.* شێوەی لە M دەکات.
**ma** (mä), *n.* [Colloq.], دایك؛ دایە
(کورتەی " mama " ) یە.
**M.A.**, [Magister Artium= Master of Arts], ماستەر (بڕوانامە)؛
ماجستێر
**ma'am** (mam, mäm; *unstressed* məm, 'm), *n.* [Colloq.], = **madam.**
**Mac-, Mc-, Mc-** (mak, mək, mə), پێشگری هەندێ نازناوە
بەمانای: کوڕی؛ کوڕی فلان کەس (لە نازناوی ئوسکوتلەندی‌و ئێرلەندیدا).
**macaber** (mə-kä'bēr), *adj.* = **macabre.**
**macabre** (mə-kä'brə, mə-kä'bēr), *adj.* (١) دەربارەی مردن‌و
باسی ناخۆشییە (چیرۆك، شانۆنامە). (٢) ترسناك؛ سامناك؛ زۆر ناخۆش‌و
دڵپەستکەر (باس، چیرۆك).
**macadam** (mə-kad'əm), *n.* (١) وردە بەردی شکاو؛ وردە بەرد؛
چەو. (٢) ڕێی چەوڕێژکراو.
**macadamia** (mə-kad'ə-miə), *n.* جۆرە درەختێکی ئوسترالیی‌یە
بەرەکەی ئەوەندەی دوو دەنکەنۆکە زۆر خۆشە پێی دەوترێ:
. " macadamia nuts "
**macadamize** (mə-kad'əm-īz'), *v.t.* ڕێ چەوڕێژکردن.
**macaque** (mə-käk'), *n.* جۆرە مەیمونێکی کلك کورتە.
**macaroni** (mak'ə-rō'ni), *n.* (١) مەعکەرۆنی.
(٢) تەڕپۆشێکی ئینگلیزی سەدەی هەژدەهەم کە لاسایی بێگانەی دەکردەوە لە
بەرگ‌و ڕەووشتیدا؛ کەسێکی تەڕپۆش.
**macaronic** (mak'ə-ron'ik), *adj.* (١) لە چەند زمانێك پێکهاتوو.
(٢) [Obs.]، دووڕەگ؛ تێکەڵاو؛ تێکەڵاووپێکەڵاو.
*n.* (١) هۆنراوەی لە چەند زمانێك پێکهاتوو.
(٢) [Obs.] .(pl.)، شتێکی تێکەڵاو یا دووڕەگ؛ شتێکی مەمەجۆر.
**macaroon** (mak'ə-rōōn'), *n.* ماکەروون: شیرینی‌یەکە لە شەکرو
سپێنەی هێلکەو بادەمی هاڕاو و گوێزی هیندی دروست دەکرێ.
**macaw** (mə-kô'), *n.* جۆرە تووتی‌یەکی کلك درێژی دەنووك
نووشتاوەی پەڕ ڕەنگاوڕەنگە.
**maccaboy, maccoboy** (mak'ə-boi'), *n.* بڕنووتی.
**mace** (mās), *n.* (١) کوتەکێکی سەر ئاسنینەی دڕکاوی‌یە (لە کۆندا
قەڵغانی پێ دەشکێنرا). (٢) گورزی فەرمانڕەوا؛ داردەستی فەرمانڕەوایی.
(٣) هەڵگری ئەم داردەستە. (٤) داری بلیارد؛ داری یاری‌یەکە وەك بلیارد.
**mace** (mās), *n.* جۆرێکە لە بەهارات.
**macebearer** (mās'bâr'ēr), *n.* هەڵگری گورزی فەرمانڕەوایی لە
ڕێ ڕۆیشتندا.
**macedoine** (mas'ā-dwän'), *n.* (١) زەڵاتەیەکی تێکەڵاو لە
سەوزەو میوە. (٢) شتی تێکەڵاو.
**macer** (mās'ēr), *n.* = **macebearer.**
**macerate** (mas'ə-rāt'), *v.t.* (١) (ا) خووساندن؛
نەرم کردنەوەی شتێکی ڕەق بە خووساندن. (ب) لێك جیاکردنەوەی شتێکی
ڕەق یا توندوتۆڵ بە خووساندن (بەتایبەتی لە گەدەو ڕیخۆڵەدا).
(٢) لە برسدا ووشك کردنەوە؛ پووکاندنەوە بە برسێتی؛ لاوازکردن.
(٣) چەوساندنەوە؛ ئازاردان
*v.i.* پووکانەوە لە برسدا؛ لە برسدا ووشك بوونەوە؛ لاوازبوون.
**macerater; macerator** *(n.)*; **maceration** *(n.)*.
**machete** (mä-chā'tā, mə-shet', mə-shet'i), *n.* تەوراس؛
چەپەچاغ.
**Machiavellian, Machiavelian** (mak'i-ə-vel'i-ən, mak'yə-vel'yən), *adj.* (١) میکیاڤیلی؛ تایبەتی بە میکیاڤیلی.
(٢) میکیاڤیلیانە؛ تایبەتی بە میکیاڤیلی و بیروباوەڕی دەربارەی فەرمانڕەوایی
کە بریتی‌یە لە هەڵخەڵەتاندن‌و فێڵ‌وتەڵەکەو دووڕوویی‌و ناپاکی؛ ناپاك؛
فێڵباز؛ دووڕوو.
*n.* کەسێکی میکیاڤیلی، واتە کە بڕوای بە فێڵ‌وتەڵەکەو دووڕوویی‌و ناپاکی‌و
هەڵخەڵەتاندن هەبێت.
**Machiavellism** (mak'i-ə-vel'iz'm), *n.* میکیاڤیلیتی؛
بیروڕاو فەلسەفەی میکیاڤیلی دەربارەی فەرمانڕەوایی کە دەڵێت:
بۆ گەیشتن بە بەمەبەستی خۆ مرۆڤ یا حیزب بۆی هەیە فێڵ‌وتەڵەکەو ناپاکی‌و
دووڕوویی‌و هەڵخەڵەتاندن بەکاربهێنێت؛ هەلپەرستی ڕامیاری.
**machicolation** (mə-chik'ə-lā'shən), *n.* (١) کونی زەمینەی
قوللە یا سەنگەرێکە کە شلەی گەرم‌و بەردی گەورەی لێوە بەردەدرێتەوە بەسەر
دوژمندا. (٢) دیواری قوللە یا سەنگەری کوندار.
**machinate** (mak'ə-nāt'), *v.i. & v.t.* پیلان گێڕان؛ پیلان لێکردن.
**machination** (mak'ə-nā'shən), *n.* (١) پیلان گێڕان؛ پیلانبازی.
(٢) (pl.)، پیلان.
**machinator** (mak'ə-nā'tēr), *n.* پیلانگێڕ؛ پیلانباز.
**machine** (mə-shēn'), *n.* (١) [Rare] ، چوارچێوەی لەشی مرۆڤ‌و
گیاندار. (٢) (ا) گالیسکە. (ب) ئوتومبیل.
(٣) مەکینە؛ خەرەك: *( a sewing ~ )* .
(٤) کەسێك یا ڕێکخراوێك کە وەك مەکینە کار بکات، واتە بەبێ بیرکردنەوە.
(٥) (ا) ئەندامانی بەڕێوەبەری حیزب یا ڕێکخراوێك.
(ب) دامودەزگای حیزب یا ڕێکخراوێك؛ حیزب.
(٦) ئامێر یا هۆی نواندنی شتی سەیرو ناسرووشتی لەسەر شانۆ (بەتایبەتی
لەسەر شانۆی یۆنانی کۆندا). (٧) ئامێری ووزە گوێزەرەوە.
*adj.* (١) مەکینەیی؛ تایبەتی بە مەکینە. (٢) بە مەکینە دروستکراو.
(٣) یەك بابەت کراو؛ وەك یەك لێکراو؛ بە یەك ئەندازە کراو.
*v.t.* بە مەکینە کردن.
**machine-gun** (mə-shēn'gun'), *v.t.* گوللەپرژێن کردن؛
دانەبەر گوللە (بە گوللەپرژێن).
**machine gun,** گوللەپرژێن؛ ڕەشاش؛ شەست تیر.
**machine-made** (mə-shēn'mād'), *adj.* بە مەکینە کراو، نەك

بە دەست؛ هی مەکینە.

**machinery** (mə-shēn′ēr-i, mə-shēn′ri), *n.* (١) مەکینە؛ مەکینەکان. (٢) پارچەکانی مەکینە.
(٣) داموودەزگا؛ دەزگا: ***( the ~ of government)*** .

**machine shop,** کارگەی مەکینە دروستکردن و چاك کردنەوە؛ مەکینەخانە؛ وەرشەی مەکینە.

**machine tool,** ئامێری مەکینە دروستکردن.

**machinist** (mə-shēn′ist), *n.* (١) مەکینەچی؛ ئاش وەستا.
(٢) کرێکارێکی شارەزاو لێهاتووی ئامێری مەکینە دروستکردن.
(٣) ئەفسەری مەکینەچی (هێزی دەریایی ئەمەریکی).

**machismo** (mä-chēz′mō), *n.* زۆر خۆنواندن بە نێرێتی و ئازایەتی و زاڵێتی و بەسەر ژندا خوڕین.

**Mach number, mach number,** ڕێژەی نێوان خێرایی شتێك و خێرایی دەنگ لە هەمان دەوروبەردا (وەك هی فڕۆکەو دەنگ لە هەوادا).

**macho** (mä′chō), *adj.* زۆر خۆنوێنەر بە نێرێتی و ئازایەتی و خۆبادان بەسەر ئافرەتدا.
*n.* (١) **machismo** .
(٢) پیاوێکی زۆر خۆنوێن بە نێرێتی و زاڵێتی و خۆبادەر لەبەرچاوی ئافرەت.

**mackerel** (mak′ēr-əl), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریایییە.

**mackintosh** (mak′in-tosh′), *n.* (١) مشەمای باران؛ پاڵتۆی باران.
(٢) قوماشی ئەم جۆرە پاڵتۆیە.

**mackle** (mak′′l), *n.* لەکە (چاپەمەنی)؛ لێڵی شتێکی لەچاپدراو لەبەر لەکە یا جووت بوونی دوو دێڕ بەسەر یەکەوە.

**macle** (mak′′l), *n.* (١) جووت بلوور. (٢) لەکەی کانزایەك.

**macramé** (mak′rə-mā′), *n.* نەقش و نیگاری چنراو؛ شتی چنراو بە ڕیشووەوە (بۆ هەڵواسین بۆ جوانی یا بەسەر شتی ناوماڵدا دان) .

**macro-, macr-** (mak′rō, mak′rə), پێشگرێکە بەمانای: گەورە؛ زل؛ درێژ: ***( macrocosm)*** .

**macrocephaly** (mak′rə-sef′ə-li), *n.* کاسەی سەر گەورەیی (بەتایبەتی لە کەسانی مێشك سووکدا دەبینرێت) .

-**macrocephalic; macrocephalous** ***(adj.)***.

**macrocosm** (mak′rə-koz′m), *n.* گەردوون؛ گێتی.

-**macrocosmic** ***(adj.)***.

**macron** (mā′krən, mak′ron), *n.* هێڵێکی کورتە ( − ) نیشانەی درێژییە لە خوێندنەوەدا (دەخرێتە سەر تیپە بزوێن) .

**macroscopic** (mak′rə-skop′ik), *adj.* بە چاو دەخوێنرێتەوە (دژی ووشەی " **microscopic** " ە ) .

**macula** (mak′yoo-lə), *n.* (١) پەڵە (بەتایبەتی هی سپی یا ڕەش بەسەر پێستەوە). (٢) پەڵەی سەر خۆر.

**maculate** (mak′yoo-lāt′), *v.t.* پیس کردن؛ لەکەدارکردن.
*adj.* (١) لەکاوی؛ پەڵەدار؛ لەکەدار. (٢) پیس؛ ناخاوێن.

**maculation** (mak′yoo-lā′shən), *n.* (١) لەکەدارکردن؛ پەڵاوی کردن (٢) لەکەداری؛ پیسی؛ پەڵاوی.
(٣) پەڵەی پێستی گیاندارو ڕووەك (وەك هی پڵنگ) .

**macule** (mak′ūl), *v.t. & v.i.* لێڵ کردن.
*n.* پەڵە (چاپەمەنی، بە پێستەوە وەك هی ئاوڵە... هتد).

**mad** (mad), *adj.* (١) شێت؛ مێشك تێکچوو.
(٢) بێ مێشك؛ نازیر؛ بێ مانا.
(٣) شێت و شەیدا؛ شەیدا: ***( She's ~ about him.)*** .
(٤) هار: ***( a ~ dog)*** .
(٥) [Colloq.]، زویر؛ تووڕە؛ تۆراو؛ دڵ ئێشاو؛ لووت خوار.

**drive a person mad,** شێت کردن.

**go mad,** شێت بوون

**like mad,** (١) شێتانە؛ وەك شێت. (٢) بە پەلە؛ خێرا.

**madam** (mad′əm), *n.* (١) ئافرەت؛ ژن؛ خان (بۆ بانگ کردنی ژن) (گەلێك جار دەووترێ: " **ma'am** " ) . (٢) کەیبانوو؛ کابان.
(٣) بەڕێوەبەری قەحبەخانە.

**madame** (må′dåm′), [Fr.], *n.* ( pl. **Mesdames**), ( abbr. **Mme; Mdme.**), خاتوو؛ خان: نازناوی ئافرەتی مێردداره وەك ووشەی " **Mrs.** " ی ئینگلیزی .

**madcap** (mad′kap′), *n.* کەسێکی هەڵەشەو پەتەڕی (بەتایبەتی کچ) .
*adj.* پەتەڕی؛ هەڵەشە.

**madden** (mad′′n), *v.t.* (١) شێت کردن. (٢) تووڕەکردن؛ پەستکردن.
*v.i.* زۆر تووڕەبوون؛ زۆر پەست بوون.

**madder** (mad′ēr), *n.* (١) ڕووەکێکە دەرمان و خومی لێ دەگیرێ.
(٢) (ا) ڕەنگی سووری ئەم ڕووەکە. (ب) خومی سوور کە لەم ڕووەکە دەگیرێ.
(٣) سووری ئاڵ؛ قرمزی؛ ئاڵ.

**madder** (mad′ēr), *adj. comperative of* **mad,** شێتتر؛ تووڕەتر.

**madding** (mad′iŋ), *adj.* (١) [Rare] ، هەڵچوو؛ حاڵ لێهاتوو؛ شێت؛ بە جۆش و خرۆش؛ هار: ***( the ~ crowd)*** .
(٢) شێتکەر؛ تووڕەکەر.

**made** (mād), *past tense and past participle of* **make.**
*adj.* (١) کراو؛ دروستکراو؛ پێکهێنراو: ***( a well- ~ play, plan, car, etc.)***
(٢) دەستکرد؛ ناسرووشتی.
(٣) داهێنراو؛ داتاشراو: ***( a ~ word)*** .
(٤) بەتایبەتی ئامادەکراو؛ لەخۆوە کراو: ***( a ~ dish)*** .
(٥) سەرکەوتوو: ***( a ~ man)*** .

**made for,** پڕ بە پێستی خۆیەتی؛ بۆ یەکتری باشن؛ پێ ی دەکات؛ گونجاو: ***( The two are made for each other.)*** .

**mademoiselle** (mad′ə-mə-zel′), *n.* [Fr.], (١) خاتوو؛ خان: نازناوی کچە وەك ووشەی " **Miss** " ی ئینگلیزی. (٢) لەلەی فەرەنسی.

**made-to-order** (mād′tə-ôr′dēr), *adj.* (١) دەستدروو؛ دەستکرد؛ بەپێ ی ئارەزووی کڕیار کراوە. (٢) زۆر لەبار؛ باش؛ گونجاو

**made-up** (mād′up′), *adj.* (١) ڕێکخراو؛ ئامادەکراو.
(٢) هەڵبەستراو؛ درۆ؛ داتاشراو؛ دروستکراو: ***( a ~ story)*** .
(٣) سووروسپیاوکراو؛ بە سووراو و سپیاوەوە: ***( a ~ face)*** .

**madhouse** (mad′hous′), *n.* (١) شێتخانە.
(٢) شوێنێکی پڕ لە پشێوی و دەنگەدەنگ؛ حەمامی ژنان.

**madly** (mad′li), *adv.* (١) شێتانە.
(٢) زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ بەجۆشەوە: ***( ~ in love)*** .
(٣) زۆر بە شپرزەیییەوە؛ وەك حاڵ لێهاتوو.
(٤) بە کەرانە؛ بە کەرێتی.

**madman** (mad′man′, mad′mən), *n.* کەسێکی شێت؛ دێوانە؛ شێت.

**madness** (mad′nis), *n.* (١) شێتی؛ دێوانەیی.
(٢) زۆر تووڕەیی. (٣) کەرێتی؛ گەوجێتی. (٤) جۆش و خرۆشی؛ جۆش.
(٥) هاری؛ هارێتی.

**Madonna** (mə-don′ə), *n.* (١) [m-] ، خاتوو: نازناوێکی کۆنە لە زمانی ئیتاڵیدا بۆ ژن وەك ووشەی " **madam** " .
(٢) ( **the ~** )، (ا) مریەم (دایکی عیسا). (ب) وێنەو پەیکەری مریەم.

**madras** (mad′rəs, mə-dras′, mə-dräs′), *n.* (١) قوماشی مەدراس؛ قوماشێکی ئاوریشمی خەت خەتی قایمە.
(٢) دەسمەسرێکی گەورەی ئاوریشم.
*adj.* مەدراسی (قوماش، بەرگ).

**madrigal** (mad′ri-g′l), *n.* (١) هەڵبەستێکی دڵداری کورت کە بکرێت بە گۆرانی. (٢) (ا) گۆرانییەکی چەند کەسی بەبێ مۆسیقا.
(ب) گۆرانییەکی دوودەنگی بەبێ مۆسیقا.

-**madrigalist** ***(n.)***.

**madrona** (mə-drō′nə), *n. Also* **madrono; madrone,** (١)- درەختێکی هەمیشە سەوزی گوڵ سپی گەڵا بریقەدارە بەرەکەی دەخورێت. (٢) بەری سووری بۆ خواردن شیاوی ئەم دارە.

**maduro** (mə-door′ō), *n.* سیگارێکی ڕەش و توندوتیژ.

**madwoman** (mad′woom′ən), *n.* ئافرەتێکی شێت.

**madwort** (mad′wûrt′), *n.* جۆرە ڕووەکێکە لە تۆخمی خەرتەلە.

**maelstrom** (māl′strəm), *n.* (١) گێژاوێکی گەورەو بەهێزو ترسناك؛ گەردار (٢) هێزێکی وێرانکەری بەهێز؛ پشێوییەکی گەورە (لە مێشك، جیهان، یا کاروباردا)؛ گێژاو: *( They were caught in the ~ of war.)* .

**maenad, menad** (mē′nad), *n.* (١) کچی بەشداری ئاهەنگ و زەماوەندی مەی خواردنەوەی دایۆنایسس و باکۆس (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان). (٢) ئافرەتی دێوانە؛ ژنی شەیدا یا حاڵ لێهاتوو.

**maestro** (mīs′trō, mä-es′trō), *n.* مامۆستای لێهاتووی مۆسیقا؛ دانەری مۆسیقا؛ مامۆستای هونەری مۆسیقا.

**maffia, mafia** (mä′fi-ä′), *n.* (١) دژایەتی بە میری؛ دژ وەستان بە فەرمانڕەوایی. (٢) [M-]، مافیا: دەستەیەکی نهێنی خراپەکارە لە ئەمەریکا کە هەر خەریکی قاچاخچێتی و پارە بەزۆر لە خەڵك سەندن و پیاوکوشتنن (لە بنەچەی ئیتاڵین).

**magazine** (mag′ə-zēn′), *n.* (١) عەمار. (٢) عەماری تەقەمەنی (لە قەڵا یا کەشتی جەنگدا). (٣) (ا) شانە (چەکی ئاگرین). (ب) شوێنی فیلم لە کامێرادا. (٤) ئازووقەو تەقەمەنی و شتی تری هەڵگیراو (لە عەمار یا قیشەکداندا). (٥) گۆڤار.

**maggot** (mag′ət), *n.* (١) کرمۆکە (بەتایبەتی لەناو شتی ڕزیو و کرم تێداودا). (٢) بیرێکی سەیر.

**maggoty** (mag′ət-i), *adj.* (١) کرماوی؛ کرم تێداو؛ کرمۆکاوی. (٢) پڕ لە بیری سەیر یا هەوەسبازی؛ هەوەسباز.

**Magi** (mā′jī), *n.pl.* (١) دەستەی مەجووس (کە گوایە توانای لە سرووشت بەدەر یا ئەفسوونی هەبووە). (٢) ئەو سێ ڕیش سپییە بوون کە هاتن بەپیر لەدایکبوونی عیساوە و دیارییان بۆ هێنا (ئینجیل).

**magic** (maj′ik), *n.* (١) جادووگەری؛ جادووبازی؛ جادوو؛ تەلیسم؛ ئەفسوون؛ سیحر. (٢) شتێکی ئەفسوونی: *( the ~ of love)* .

*adj.* ئەفسوونەیی؛ جادوویی.

**magical** (maj′i-k'l), *adj.* ئەفسوونەیی؛ جادوویی؛ تەلیسماوی: *( ~ power; The result was ~ .)*

-**magically** *(adv.).*

**magician** (mə-jish′ən), *n.* جادووگەر؛ جادووباز؛ ئەفسوونباز.

**magic lantern,** فانۆسی سیحری؛ چرای ئەفسوونی.

**magisterial** (maj′is-têr′i-əl), *adj.* (١) دادپرسی؛ دادگەری؛ تایبەتی بە دادگەر: *( ~ rank)* . (٢) بەشکۆ؛ بە کەش و فش؛ زۆردارەکی؛ بەدەسەڵاتی: *( ~ opinion, manner, etc.)*

**magistracy** (maj′is-trə-si), *n.* (١) پلەوپایەی دادگەر. (٢) دادگەران؛ دەستەی دادگەران. (٣) دادگەرنشین.

**magistral** (maj′is-trəl), *adj.* (١) بەشکۆ؛ دیکتاتۆری؛ کەش و فش؛ زۆردارەکی. (٢) سەرەکی؛ بنچینەیی: *( the ~ line of fortification)* . (٣) بەتایبەتی ئامادەکراو بۆ نەخۆشییەکی تایبەتی (ڕەچەتە، دەرمان).

**magistrate** (maj′is-trāt′, maj′is-trit), *n.* (١) دادپرس؛ دادگەر. (٢) فەرماندە.

**magma** (mag′mə), *n.* (١) گیراوەی کانزایی. (٢) بەردی تواوەی ژێرزەمین (کە بەردی ئاگرپڕژێنی لێ دروست دەبێت). (٣) تلپەی میوەی گوشراو.

**Magna Charta, Magna Carta** (mag′nə kär′tə), (١)- ماگناکارتا: بڕوانامەی بەناوبانگی ئینگلیزی کە گەلێك ماف و سەربەستی دا بە گەلی ئینگلیزی لە ساڵی ١٢١٥ دا. (٢) بڕوانامەیەکی دەستووری کە ماف و سەربەستی بدات بە گەل.

**magna cum laude** (mag′nə kum lôdi), [L.], زۆر پەسەند؛ بە نمرەی زۆر باش: بڕوانامەی زۆر پەسەندو بەرزی دەرچوونی لێهاتووی زانکۆ.

**magnanimity** (mag′nə-nim′ə-ti), *n.* (١) بەخشندەیی؛ جوامێری؛ لەخۆبووردن. (٢) کارێکی جوامێرانە یا بەخشندەییانە.

**magnanimous** (mag-nan′ə-məs), *adj.* بەخشندە؛ جوامێر؛ لەخۆبووردوو؛ ڕەووشت بەرز؛ پیاو.

**magnate** (mag′nāt), *n.* کەسێکی دەوڵەمەندو بەدەسەڵات و ناودار بەتایبەتی لە پیشەسازی، بازرگانی، یا کاروکاسبیدا: *( a cotton ~ )*

**magnesium** (mag-nē′shi-əm), *n.* مەگنیسیۆم.

**magnet** (mag′nit), *n.* (١) ئاسن ڕفێن؛ موگناتیس. (٢) کەسێك، شتێك، یا شوێنێکی دڵفڕێن.

**magnetic** (mag-net′ik), *adj.* (١) ئاسن ڕفێن؛ موگناتیسی. (٢) موگناتیساوی دەکرێت؛ بە موگناتیس ڕادەکێشرێت. (٣) دڵڕفێن؛ جوان (ڕەووشت، ڕووخسار)؛ خەڵك ڕاکێش؛ دڵ ڕاکێش *( a ~ personality)*

-**magnetically** *(adv.).*

**magnetic field,** مەیدای موگناتیسی: ئەو مەیدایەی کە موگناتیس دەتوانێ ئاسنی لێوە ڕاکێشێ.

**magnetic flux,** سەرجەمی تەووژمی موگناتیسی.

**magnetic needle,** دەرزی موگناتیسی.

**magnetic pole,** (١) جەمسەری موگناتیسی. (٢) [M- P-]، جەمسەری زەمین (کە دەرزی موگناتیسی ڕووی تێدەکات).

**magnetic tape,** شریتی موگناتیسی: توێژاڵی کانزایی یا پلاستیکی موگناتیس لێدراوە دەنگ و بەرنامەی تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەرو شتی تری لەسەر تۆمار دەکرێ.

**magnetics** (mag-net′iks), *n.pl.* زانیاری موگناتیس؛ موگناتیسناسی.

**magnetism** (mag′nə-tiz'm), *n.* (١) ئاسن ڕفێنی؛ موگناتیسێتی. (٢) magnetics . (٣) دڵڕفێنی؛ توانای دڵ ڕاکێشان. (٤) نوواندنی موگناتیسی.

**magnetize** (mag′nə-tīz′), *v.t.* (١) کردن بە ئاسن ڕفێن؛ موگناتیساوی کردن؛ موگناتیس لێدان. (٢) دڵ ڕفاندن؛ دڵ ڕاکێشان. (٣) [Rarc]. نوواندنی موگناتیسی.

*v.i.* بوون بە ئاسن ڕفێن؛ موگناتیساوی بوون؛ وەك موگناتیس لێهاتن.

-**magnetization** *(n.).*

**magneto** (mag-nē′tō), *n.* دینەمۆی موگناتیسی؛ ئامێری ئەلەکتریك دروستکەری موگناتیسی.

**magnetoelectric** (mag-nē′tō-i-lek′trik), *adj.* کارەبایی موگناتیسی؛ تایبەتی بە کارەبایەك کە بە دینەمۆی موگناتیسی دروست دەکرێت.

**magnetoelectricity** (mag-nē′tō-i-lek′tris′ə-ti), *n.* کارەبای موگناتیسی.

**magnetogenerator** (mag-nē′tō-jen′ə-rā′tēr), *n.* = magneto.

**magnetometer** (mag′nə-tom′ə-tēr), *n.* پێوەری هێزی موگناتیسی؛ ئامێری پێوانی هێزی مەیدای موگناتیسی.

**magnetoscope** (mag-nē′tə-skōp′), *n.* ئامێری دۆزەرەوەی هێزی موگناتیسی.

**magnific** (mag-nif′ik), *adj.* [Obs.], = **magnificant.**

**magnification** (mag′nə-fi-kā′shən), *n.* گەورەکردن (بە ووردبین)؛ زل کردن (وێنە، قەبارە)؛ والێکردن کە گەورەتر بنوێنێ.

**magnificence** (mag-nif′ə-s'ns), *n.* جوانی و نایابی و بەشکۆیی و شۆخ و شەنگی: *( the ~ of the scenery, her dress, her act, etc.)* .

**magnificent** (mag-nif′ə-s'nt), *adj.* (١) زۆر جوان و نایاب؛

شۆخ‌وشەنگ؛ بەشکۆ؛ زۆر جوان ڕازاوە:
*( a ~ house, city, dress, carpet, etc.)*
(٢) زۆر باش؛ نایاب. *( a ~ place for sailing; a ~ book; ~ food)* .
(٣) بەرز (بیروباوەڕ)؛ زۆر چاك‌و بەجێ: *( a ~ idea)* .
**magnifico** (mag-nif′ə-kō′), *n.* (١) بەگزادەیەکی ڤینیسیای کۆن.
(٢) بەگزادە؛ کەسێکی پلەوپایە بەرزو ناودار.
**magnifier** (mag′nə-fī′ẽr), *n.* (١) زلکەر (مرۆڤ)؛ گەورەکەر.
(٢) ئامێری گەورەکەر (گەردبین، چاویلکە).
**magnify** (mag′nə-fī′), *v.t.* (١) [Rare] . گەورەکردن (قەبارە، پلەوپایە). (٢) زیادە پێوەنان؛ دانەدەم؛ گەورەکردن (دەنگوباس، چیرۆك):
*( She ~ied her sufferings in telling about them.)*
(٣) وەهالێکردن کە گەورەتر بنوێنێ (بە گەردبین)؛ گەورەترکردن.
(٤) [Archaic]، شکۆپێدان؛ مەزن کردن؛ زۆر ستایش کردن.
*v.i.* گەورەکردن
*( Telescopes and microscopes ~ .)*
**magnifying glass,** گەردبین؛ وردبین.
**magniloquent** (mag-nil′ə-kwənt), *adj.* (١) ووشەی زل‌و ڕازاوەو بە کەش‌وفش بەکارهێنەر. (٢) گەزاف لێدەر؛ فشەچی؛ خۆبادەر؛ خۆهەڵکێش
-**magniloquence** *(n.)*; **magniloquently** *(adv.)*.
**magnitude** (mag′nə-to͞od′, mag′nə-tūd′), *n.* (١) گەورەیی
(ا) قەبارە. (ب) ڕادە؛ پلە: *( an earthquake of great ~ )*
(ج) گرنگی؛ بەرزی: *( the ~ of his achievement)* .
(٢) پلەی ڕووناکی ئەستێرە
**of the first magnitude,** زۆر گرنگ؛ نمرە یەك.
**magnolia** (mag-nō′li-ə, mag-nōl′yə), *n.* (١) ماگنۆلیا: ڕووەکێکە گوڵی سپی‌و پەمەیی‌و ئەرخەوانی بۆن خۆش دەگرێت.
(٢) گوڵە ماگنۆلیا.
**magnum** (mag′nəm), *n.* (١) شووشەیەکی مەی‌و خواردنەوەی ترە (بریتی‌یە لە دوو لەسەر پێنجی گالۆنێك). (٢) پڕی ئەم شووشەیە.
**magnum opus** (mag′nəm ō′pəs), [L.], (١) شاکار (بەتایبەتی بەرهەمێکی ویژەیی، هونەری، یا مۆسیقی). (٢) گەورەترین بەرهەم یا شاکاری نووسەرێك یا هونەرمەندێك
**magpie** (mag′pī′), *n.* (١) قەلەباچکە. (٢) کەسێکی نۆزەنۆز.
**maharajah, maharaja** (mä′hə-rä′jə), *n.* مەهراجا: شازادەی هیندی؛ میری هیندی
**maharani, maharanee** (mä′hə-rä′nē), *n.* (١) ژنی مەهراجا (ووشەی پێشوو ببینە). (٢) شاژنی هیندی (کە فەرمانڕەوایی هەرێمێکی هیندستانی کردووە).
**mahatma** (mə-hat′mə, mə-hät′mə), *n.* مەهاتما: کەسێکی زۆر تێگەیشتوو و پیرۆزو دانا کە توانای شتی نائاسایی هەبێ (ئاینی بوودی).
**mahogany** (mə-hog′ə-ni, mə-hôg′ə-ni), *n.* (١) تەختەداری مەهۆگەنی: تەختەدارێکی ڕەق‌و نایابی قاوەیی سووربارە مێزو کورسی لێ دروست دەکرێ. (٢) درەختی مەهۆگەنی. (٣) قاوەیی سوورباو.
*adj.* (١) لە مەهۆگەنی دروستکراو. (٢) قاوەیی سوورباو.
**mahout** (mə-hout′), *n.* فیلەوان.
**maid** (mād), *n.* (١) کچ.
(٢) قەیرە کچ. (هەروەها پێشی دەووترێ: " old maid " ) .
(٣) کارەکەر.
**maiden** (mād′′n), *n.* (١) کچ؛ ئافرەتی کون نەکراو.
(٢) ئەسپێك کە هەرگیز پێشبڕکێ‌یەکی نەبردبێتەوە.
(٣) [M-]، ئامێرێکی ئوسکوتلەندی‌یە لە گیلۆتینی فەرەنسی دەچێ (لە سەدەی شانزەو حەڤدەدا تاوانباری پێ سەردەبڕا).
*adj.* (١) بۆ کچ شیاو؛ بۆ کچ باشە. (٢) کچ؛ کون نەکراو؛ بندار.
(٣) تازە؛ فەریك؛ نەشارەزا؛ بەکارنەهێنراو؛ نوێ.
(٤) یەکەم: *( a ~ speech, voyage, etc.)* .
(٥) هیچ پێشبڕکێ‌یەکی نەبردۆتەوە (ئەسپ): *( a ~ horse)* .
**maidenhair** (mād′′n-hâr′), *n.* جۆرە ڕووەکێکی گەڵا ناسکی پڕە لە سێبەردا باش دەڕوێت.
**maidenhead** (mād′′n-hed′), *n.* (١) [Archaic] ، بنداری؛ بەبنی؛ کچێنی. (٢) بن؛ بنی کچ؛ پەردەی کچێنی.
**maidenhood** (mād′′n-hood′), *n.* کچێنی؛ بنداری؛ بەبنی.
**maidenly** (mād′′n-li), *adj.* (١) کچانە؛ تایبەتی بە کچێنی.
(٢) ناسك؛ شەرمن؛ بۆ کچ شیاو.
**maiden name,** نازناوی کچ پێش شووکردن (لە گەلێك وڵاتدا پاش شووکردن کچ نازناوی مێردەکەی وەردەگرێت).
**maidhood** (mād′hood′), *n.* = **maidenhood.**
**maid in waiting,** کارەکەری شاژن یا کچە پاشا.
**maid of honor,** (١) ناوەڵ بووك: کچێکی هاوڕێی بووکە لە کاتی مارەبڕین‌و شاییدا لەگەڵیدا دەبێت. (٢) کارەکەری شاژن یا کچە پاشا.
**maidservant** (mād′sûr′vənt), *n.* کارەکەر.
**maihem** (mā′hem), *n.* = **mayhem.**
**mail** (māl), *n.* (١) (ا) [Obs.] ، جانتا.
(ب) [Archaic]، توورەکە یا جانتای پۆستە. (٢) پۆستە.
(٣) پۆستەبەر (مرۆڤ، شەمەندەفەر، بەلەم).
(٤) پۆستە کۆکردنەوەو ناردن‌و گەیاندن بە خاوەنی.
*adj.* پۆستە؛ هی پۆستە.
*v.t.* خستنە پۆستەوە؛ بە پۆستەدا ناردن:
*( to ~ a letter, package, etc.)*
**mail** (māl), *n.* (١) قەڵغان؛ زرێ؛ گوللەبەند.
(٢) قاوغی هەندێ گیانداری وەك کیسەڵ.
*v.t.* بە قەڵغان پاراستن؛ گوللەبەند کردنەبەر.
**mailbag** (māl′bag′), *n.* توورەکەی پۆستە.
**mailbox** (māl′boks′), *n.* (١) سندووقی پۆستەی ماڵ (کە لەبەردەمی هەموو ماڵێکدایەو پۆستەچی پۆستەی ئەو ماڵەی تێ دەخات).
(٢) سندووقی پۆستەی گشتی سەر شەقام (کە خەڵك پۆستەی تێ دەخەن).
**mailed** (māld), *adj.* زرێدار.
**mailed fist,** هەڕەشە (هی نێو وڵاتان).
**mailer** (māl′ẽr), *n.* (١) پۆستەنێر؛ ناونیشاننووسی سەر پۆستە.
(٢) مەکینەی پۆستە. (٣) بەلەمی پۆستە.
**mailman** (māl′man′, māl′mən), *n.* پۆستەچی؛ پۆستەبەر؛ نامەبەر.
**mail order,** شت کڕین‌و فرۆشتن بەهۆی پۆستەوە.
**mail-order house,** دەزگای فرۆشتنی شتومەك بەهۆی پۆستەوە.
**maim** (mām), *v.t.* (١) پەل شکاندن؛ بریندارکردن؛ گۆج کردن؛ پەل بڕینەوە؛ پەککخستن: *( He was seriously ~ed in the war.)* .
(٢) شێواندن؛ تێکدان؛ پووچ کردن؛ لە کەڵك خستن:
*( The bill was ~ed by amendments.)*
**main** (mān), *n.* (١) هێز: (تەنها لەم ووتەیەدا: " **with might and main** " ) .
(٢) بەش؛ بەشی سەرەکی: *( in the ~ )* .
(٣) بۆری، هێڵ، یا تەلی سەرەکی (ئاو، ئەلەکتریك، گاز، بەنزین).
(٤) [Poetic]، دەریا؛ زەریا. (٥) (ا) تەوەری کەشتی. (ب) بایەوانی سەرەکی.
(٦) [Archaic]، **mainland** = .
(٧) [Obs.]، شوێنێکی زۆر گەورەو بڵاو (زەوی، دەشت، دەریا).
*adj.* (١) بەهێز. (٢) سەرەکی؛ بنچینەیی؛ گرنگترین؛ گەورەترین؛ گەورە.
(٣) تایبەتی بە شوێنێکی گەورەو پان (زەوی، ئاو).
(٤) هی تەوەری سەرەکی کەشتی؛ هی بایەوانی کەشتی.
(٥) [British Dial.]، ئێجگار زۆر.
**by main force ( or strength),** تەنها بە هێز؛ هەر بە زۆر.

**in the main,** بەزۆری؛ بەشێوەیەکی گشتی.

**main clause,** شارستەی سەرەکی (کە بە تەنهایش مانا دەبەخشێ لە ڕستەیەکی ئاڵۆزدا وەك: " She will visit us " لەم ڕستەیەدا: " She will visit us if she can ").

**main drag,** [Slang], شەقامی سەرەکی.

**mainland** (mān′land′, mān′lənd), *n.* بەشی سەرەکی وڵات یا کیشوەرێك (نەك دوورگەکانی دەوروپشتی).

**mainly** (mān′li), *adv.* (١) بەزۆری؛ بەگشتی.
(٢) [Archaic]، زۆر؛ ئێجگار؛ تا ڕادەیەکی زۆر.

**mainmast** (mān′məst, mān′mast′, mān′mäst′), *n.* تەوەری سەرەکی بەلەمی با.

**mainsail** (mān′s'l, mān′sāl′), *n.* بایەوانی سەرەکی.

**mainspring** (mān′spriŋ′), *n.* (١) زەمبەلەکی سەرەکی (کاتژمێر).
(٢) هۆی سەرەکی؛ پاڵ پێوەنەری سەرەکی.

**mainstay** (mān′stā′), *n.* (١) گوریسی ڕاگری تەوەری سەرەکی بەلەم و کەشتی. (٢) پاڵپشتی سەرەکی؛ پایە؛ کۆڵەکە:
*( Her son is her ~ .)*

**mainstream** (mān′strēm′), *n.* ڕێڕەوی گشتی، سەرەکی، زاڵ، بڵاو. یا باوی مەیدانێکی تایبەتی کۆمەڵ؛ ڕای سەرەکی ڕشتەیەك یا کۆمەڵێك: *( He is in the ~ of the Democratic Party.)*.

**main street,** (١) شەقامی سەرەکی.
(٢) [M- S-]. هەڵوێستی دانیشتووانی شارۆچکە کە بریتییە لە پارەپەرستی و مێشك تەسکی و خۆپەسەندی

**maintain** (mān-tān′), *v.t.* (١) بەردەوام بوون لەسەر؛ نەگۆڕین؛ ڕاگرتن؛ لەسەر ڕۆیشتن:
*( to ~ the same speed, standard of living, etc.)*
(٢) بەردەوامی پێدان: *( Food ~s life.)*.
(٣) بە پاکی و چاکی ڕاگرتن؛ لە دۆخی خۆیدا ڕاگرتن:
*( to ~ a car, house, roads, etc.)*
(٤) پاراستن (دژی هێرش).
(٥) پاڵپشتی کردن (بە دەم لە گفتوگۆ یا مشتومڕدا)؛ سووربوون لەسەر؛ وا ووتن بەیتا بەیتا:
*( Throughout the trial he ~ed he was innocent.)*
(٦) یارمەتیدان؛ پاراستن.
(٧) بەخێوکردن؛ ژیاندن: *( He can't ~ his family.)*.

**maintenance** (mān′tə-nəns), *n.* (١) بە باشی ڕاگرتن؛ ڕاگرتن؛ بەردەوام بوون؛ بەردەوامی؛ پاراستن؛ یارمەتی.
(٢) گوزەران؛ مایەی ژیان. (٣) بەخێوکردن؛ یارمەتیدان؛ ژیاندن.
(٤) دەست خستنە ناو داواکارییەکەوە بە پاڵپشتی کردنی لایەك (دادگەری).

**maître d'hôtel** (me′tr' dô′tel′), [Fr.], (١) سەرەك بەردەستان (لە کۆشك، میوانخانە، یا چێشتخانەدا)؛ گەورەی بەردەستان. (٢) ئوتێلچی.
(٣) شلەیەکە لە کەرەی تواوە و کەرەوزو لیمۆ یا سرکە پێکدێت.

**maize** (māz), *n.* (١) گەنمەشامی (٢) زەردی کاڵ.

**majestic** (mə-jes′tik), *adj. Also* **majestical,** پادشایانە؛ بەرز؛ بەشکۆ؛ شکۆدار؛ بە سام؛ زۆر جوان؛ شۆخ‌وشەنگ؛ پایە بەرز.
**-majestically** *(adv.).*

**majesty** (maj′is-ti), *n.* (١) (ا) دەسەڵات و پلەوپایەی پادشا.
(ب) پادشا. (٢) [M-]، خاوەن شکۆ؛ سەروەر؛ نازناوی پادشا:
*( His, Her, or Your M~ )*
(٣) شکۆ؛ بەشکۆیی؛ پایە بەرزی؛ بەرزی؛ سام؛ جوانی و بەسامی.

**majolica** (mə-jol′i-kə, mə-yol′i-kə), *n.* (١) جۆرە گڵێنەیەکی نەقش‌ونیگارداری ئیتاڵی کۆنە. (٢) گڵێنەیەك کە لاسایی ئەمە بکاتەوە.

**major** (mā′jẽr), *adj.* (١) (ا) گەورەتر (قەبارە، ژمارە، ڕادە).
(ب) گرنگتر (پلەوپایە)؛ گەورەتر. (٢) باڵق؛ بلوق بوو؛ هەراش.
(٣) زۆربە؛ بەشی زۆری: *( a ~ part)*.
(٤) هی ڕشتە؛ پسپۆری؛ تایبەتی بە مەیدانی خوێندنی سەرەکی قوتابی زانکۆ.
(٥) گشتگر (ژێربێژی): *( ~ premise)*.
(٦) نۆتەی بەرز (مۆسیقا).
*v.i.* ( ~ in ), پسپۆری کردن؛ ڕشتەی تایبەتی خوێندن (قوتابی زانکۆ):
*( He will ~ in Physics.)*
*n.* (١) سەرکەوتووی پۆلێك یا مەیدانێکی تایبەتی.
(٢) پلەیەکی ئەفسەرییە (چوار ئەستێرە).
(٣) (ا) ڕشتە (خوێندن):
*( Her ~ is Psychology.; What's your ~ ?)*
(ب) قوتابییەك کە ڕشتەیەکی تایبەتی دەخوێنێ: *( He's a history ~ .)*.
(٤) کەسێکی باڵق یا هەراش.
(٥) نۆتەیەکی بەرز (مۆسیقا).

**major general,** پلەیەکی ئەفسەرییە؛ لیوا.

**majority** (mə-jôr′ə-ti, mə-jor′ə-ti), *n.* (١) زۆربە؛ زۆرترین؛ بەشی زۆر: *( The ~ of people prefer peace to war.)*.
(٢) گەورەترین ژمارەی دەنگ (هەڵبژاردن)؛ جیاوازی نێوان گەورەترین و بچووکترین ژمارەی دەنگ.
(٣) ئەو حیزبە یا کۆمەڵەی زۆرترین دەنگ وەردەگرێ.
(٤) باڵقی؛ هەراشی (تەمەنی بیست‌ویەك ساڵی):
*( He will reach his ~ next month.)*
(٥) پلەیەکی ئەفسەرییە (چوار ئەستێرە).

**join the (great) majority,** مردن.

**majuscule** (mə-jus′kūl), *n.* (١) تیپی گەورە؛ تیپی گەورەو قەڵەو (کە لە دەستنووسەکانی سەدەی ناوەڕاستدا بەکاردەهێنرا).
(٢) دەستنووسێکی بەم تیپە گەورانە نووسراو.
*adj.* تایبەتی بە تیپی گەورەو قەڵەو؛ بەم جۆرە تیپە نووسراو.

**make** (māk), *v.t.* (١) دروستکردن؛ کردن.
(٢) بوون بەهۆ: *( What made this sudden change?)*.
(٣) کردن بە؛ دانان بە: *( They made him president.)*.
(٤) واڵێکردن؛ واکردن: *( This portrait ~s her an old woman.; M~ yourself at home.)*
(٥) ڕێك‌وپێك کردن (جێی نووستن)؛ ئامادەکردن: *( M~ the beds.)*.
(٦) کردن (سەرجەم)؛ بریتی بوون لە: *( Four quarts ~ a gallon.)*.
(٧) بوون بە؛ لێ دەرچوون: *( He will ~ a good doctor.)*
(٨) دانان (پەیڕەو):
*( We made a rule that only members might attend.)*
(٩) گرتن (برادەر)؛ پەیداکردن: *( He made many friends.)*.
(١٠) پەیداکردن (پارە)؛ دەسکەوتن: *( We all want to ~ money.)*.
(١١) سەرخستن؛ کردن بە پیاو: *( This restaurant made him.)*.
(١٢) تێگەیشتن؛ لێکدانەوە:
*( What do you ~ of his strange actions?)*
(١٣) کردن: *( She made a quick movement.)*.
(١٤) کردن؛ خەریك بوون: *( to ~ war)*.
(١٥) دان (ووتار)؛ کردن (قسە)؛ بێژان: *( to ~ a speech, remark, etc.)*.
(١٦) واڵێکردن؛ بە زۆر پێ کردن: *( M~ him behave.)*.
(١٧) گەیشتن: *( The ship made port.)*.
(١٨) فریاکەوتن؛ پیاگەیشتن: *( He made the train.)*.
(١٩) چوون (بە ئیش‌وکار):
*( The salesman made six towns on this trip.)*
(٢٠) بڕین (ڕێگە، دووری):
*( They made the distance in five hours.)*
(٢١) (ا) ڕۆیشتن (خێرایی): *( My car can ~ 90 miles an hour.)*.
(ب) بڕکردن.
(٢٢) (ا) لێنان (چا، قاوە، نان‌و چێشت): *( I'll ~ you some tea.)*.
(ب) کردنەوە (ئاگر): *( Let's ~ a fire.)*.

(٢٣) [Colloq.]، وەرگیران (لە ڕێکخراوێك یا تیپێکدا)؛ گەیشتنە ئامانج:
*( He made the team.; She made the headlines.)*
(٢٤) [Slang]، تاوکردن؛ جووت بوون؛ گاین. (٢٥) یاری بردنەوە.
*v.i.* (١) دەستکردن بە کارێك یا شتێك: *( She made to go.)* .
(٢) ڕۆیشتن بەرەو؛ خۆ بۆ کوتان: *( He made for the door.)* .
(٣) بوون؛ بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەووشت نوواندن:
*( M~ bold, merry, etc.)*
(٤) کردن: *( M~ fast; M~ ready)* .
(٥) کەڵەکەبوون؛ زۆربوون؛ قووڵ بوون؛ هەڵسان (ئاو).
*n.* (١) دروستکردن؛ کردن.
(٢) بەرهەم (بەتایبەتی شتی دروستکراو)؛ سەرجەمی شتی دروستکراو.
(٣) مۆدێل؛ شێواز (شتی دروستکراو).
(٤) جۆرو شوێن و ناوی دروستکەر: *( an automobile of English ~ )* .
(٥) سرووشتی کەسی: *( a man of this ~ )* .

**make a fool ( or ass ) of,** بە کەرکردن؛ بە کەر دەرخستن؛ والێکردن کە بە کەر دیار بێ.
**make after,** ڕاکردن بە دوادا؛ شوێن کەوتن؛ نیشتنە سەر.
**make as if ( or as though ),** وا دانان
**make away with,** (١) دزین؛ بردن؛ بردن و ڕاکردن:
*( The thieves made away with two thousand dollars.)*
(٢) سەر بە گۆمدا کردن؛ خۆ لێ ڕزگارکردن.
(٣) ماشینەوە؛ هەموو خواردن. (٤) کوشتن.
**make believe,** وا دانان؛ وا نوواندن؛ وا دەرخستن:
*( The children made believe they were adults.)*
**make for,** (١) خۆ بۆ کوتان؛ چوون بەرەو.
(٢) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان. (٣) هەوڵ بۆ دان؛ کۆشش بۆ کردن.
**make haste,** پەلەکردن؛ خێراکردن.
**make it, [Colloq.],** دەسکەوتن؛ هێنانەدی؛ جێبەجێکردن؛ پێ گەیشتن (ئامانج)
**make love,** (١) دەستبازی کردن. (٢) جووت بوون؛ گاین.
**make off,** ڕاکردن؛ دەربازبوون؛ هەڵاتن؛ بۆی دەرچوون.
**make off with,** دزین؛ بردن:
*( The burglars made off with a lot of money.)*
**make or break,** یا گال دێنێ یا پەموو.
**make out,** (١) (ا) بە حاڵ بەدی کردن؛ بە ئاستەم بینین.
(ب) بە حاڵ بۆ خوێنرانەوە.
(٢) تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرچوون: *( I can't make him out.)* .
(٣) نووسین؛ نووسینەوە؛ ئامادەکردن: *( to make out a list)* .
(٤) پڕکردنەوە (ئیستمارە).
(٥) وا دەرچوون؛ وا دەرکەوتن.
(٦) وا پیشاندان؛ وا ووتن.
(٧) بە باشی ڕۆیشتن (کاروبار).
**make over,** (١) تازەکردنەوە: *( to make over a coat)* .
(٢) خستنەسەر (موڵك)؛ پێدان؛ خستنەسەر ناوی کەسێك (موڵك، سامان):
*( He has made over the whole business to his son.)*
**make the most ( or best ) of,** (١) بە باشترین شێوە بەکارهێنان:
*( He makes the most of the little he has.)*
(٢) پێ دەربردن بە هەرچۆنێك بێت.
**make up,** (١) دانان؛ نووسین؛ پێکەوەنان.
(٢) بریتی بوون لە؛ بوون؛ پێکهێنان:
*( Students make up half the population of the town.)*
(٣) هەڵبەستن (چیرۆك، درۆ)؛ ڕێکخستن؛ دروستکردن:
*( to make up stories, lies, etc.)*
(٤) تەواوکردن.
(٥) ( ~ for )، بۆ بژاردن. (٦) ڕێکخستن.
(٧) ئاشتکردنەوە؛ ئاشتبوونەوە: *( We made up.)* .
(٨) سووراوسپیاو کردن؛ ئارایشتکردن.
(٩) بڕیاردان: *( I've made up my mind.)* .
(١٠) سەرلەنوێ تاقیکردنەوە (لەبەر دەرنەچوون یا دیار نەبوون):
*( to make up a test)*
**make up for,** بۆ بژاردن؛ هەق بۆ کردنەوە:
*( We must make up for lost time.)*
**make up one's mind,** بڕیاردان:
*( Have you made up your mind?)*
**make up to,** (١) خۆ لێ بردنە پێشەوە؛ مەرایی کردن.
(٢) هەق بۆ کردنەوە: *( We must make it up to him somehow.)* .
**on the make,** (١) [Colloq.]، خەریکی پارە پەیداکردن و خۆ پێشخستنە (لەڕووی سووکییەوە).
(٢) [Slang]، خەریکی ڕاوکردنە (دلداری، تاوکردن).

**make** (māk), *n.* [Obs. or British Dial.], (١) هاوتا؛ هاوپلە؛ ئاوەڵ؛ هەڤاڵ. (٢) هاوسەر؛ دۆست.

**make-believe** (māk′bə-lēv′), *n.* (١) ڕووالەت؛ وا نوواندن؛ سەرزاری؛ ڕووالەتبازی. (٢) ڕووالەتباز؛ بە درۆ خۆ وا دەرخەر؛ خۆ وا پیشاندەر
*adj.* درۆزنە؛ درۆ؛ خەیاڵی؛ زڕخەوی:
*( a ~ character, situation, world, etc.)*

**maker** (māk′ẽr), *n.* (١) بکەر؛ دروستکەر.
(٢) [M-]، خودا. (٣) [Archaic]، هۆنەر؛ بوێژ.
(٤) ئیمزاکەری کۆمپیالە.

**makeshift** (māk′shift′), *n.* چارەی سەردەمی؛ چارەسەری کاتی.
*adj.* سەردەمی (چارە).

**make-up** (māk′up′), *n.* (١) پێکهاتن؛ شێوەی پێکهاتن:
*( the complex ~ of a corporation)*
(٢) سرووشتی مرۆڤ: *( He has an easygoing ~ .)* .
(٣) ڕێکخران؛ ڕێکخستن (تیپ و وێنەی چاپەمەنی).
(٤) (ا) ئارایشت؛ سووراوسپیاو. (ب) شێوەی ئارایشتکردن.
(ج) ئارایشت و جل و بەرگی نوێنەر (شانۆگەری).
(٥) [Colloq.]، تاقیکردنەوەی دووبارە یا لەباتی (بۆ قوتابییەکە کە لە تاقیکردنەوەی یەکەمدا کەوتبێ یا ئامادە نەبووبێ و نەیدابێ).

**making** (māk′iŋ), *n.* (١) کردن؛ دروستکردن؛ پێکهێنان؛ پێکەوەنان.
(٢) هۆی سەرکەوتن یا پێگەیشتن. (٣) (ا) شتێکی دروستکراو.
(ب) بەرهەمی یەك جار؛ ئەوەندەی جارێك دروست دەکرێ.
(ج) (*pl.*)، داهات؛ دەسکەوت.
(٤) (*pl.*)، ئەوەی پێویستە؛ نیشانە؛ تایبەخۆ:
*( He has the ~s of a good doctor.)*
(٥) (*pl.*)، [Colloq.]، کاغەز و توتنی جگەرە دروستکردن.

**mal-** (mal), پێشگرێکە بەمانای: خراپ؛ ناتەواو؛ هەڵە:
*( malfunction, maladjustment, malnutrition)*

**malaco-** (mal′ə-kə), پێشگرێکە بەمانای: (١) نەرم.
(٢) گیانداری ئاوی نەرمی قاوغدار.

**malacology** (mal′ə-kol′ə-ji), *n.* زانستی گیاندارە ئاوییە نەرمە قاوغدارەکان.

**maladjusted** (mal′ə-jus′tid), *adj.* لەگەڵ دەوروبەردا نەگونجاو، ڕانەهاتوو، یا ڕێك نەکەوتوو.

**maladjustment** (mal′ə-just′mənt), *n.* (١) لەگەڵ دەوروبەردا نەگونجان یا ڕانەهاتن. (٢) باش پێ نەکردن (پارچە مەکینە)؛ بە هەڵە چاك کراو

**maladminister** (mal′əd-min′ə-stẽr), *v.t.* خراپ بەڕێوەبردن؛ باش نەبردن بەڕێوە.
-maladministration *(n.).*

**maladroit** (mal′ə-droit′), *adj.* (١) بێ دەستوپل؛ ناکارامە؛ گەلحۆ. (٢) نەزان؛ ڕێ بەدی یی نەکەر.

**malady** (mal′ə-di), ***n.*** نەخۆشی (راستی و مەجازی):
***(spiritual ~ies; a social ~)***
**malaise** (ma-lāz′), ***n.*** بێ تاقەتی؛ کزی؛ پەستی؛ بێ ورەیی؛ لەش داهێزران؛ نارەحەتی.
**malamute** (mä′lə-mūt′), ***n.*** سەگێکی ڕێ بەهێزی ئیسکیمۆ ئەلاسکایییە.
**malapert** (mal′ə-pûrt′), ***adj.*** [Archaic], بێ حەیا؛ بێ شەرم؛ ڕووقایم.
***n.*** [Archaic], کەسێکی بێ شەرم و بێ حەیا.
**malapropism** (mal′ə-prop-iz′m), ***n.*** (١) بە هەڵە بەکارهێنانی وشەو تێکەڵ کردنی (لەبەر لەیەکچوونی دەنگیانەوە). (٢) وێنەیەکی ئەم هەڵە بەکارهێنانە.
**malapropos** (mal′ap-rə-pō′), ***adj.*** لە جێی خۆیدا نەبوو؛ نابەجێ؛ لە ناکاتدا بوو.
***adv.*** بەشێوەیەکی نابەجێ.
**malar** (mā′lẽr), ***adj.*** هی کوڵم؛ هی ئێسقانی کوڵم.
***n.*** ئێسقانی کوڵم.
**malaria** (mə-lâr′i-ə), ***n.*** لەرزوتا؛ مەلاریا
**malarkey, malarky** (mə-lär′ki), ***n.*** [Slang], قسەی بێ مانا؛ قسەی هیچ‌وپووچ
**malcontent** (mal′kən-tent′), ***adj.*** نارازی و سەرکێش (دژی ڕژێمێك یا دۆخێکی تایبەتی)؛ کینە لە دڵ.
***n.*** کەسێکی نارازی و سەرکێش؛ کەسێکی کینە لە دڵ و ئامادەی شۆڕش یا یاخی بوون.
**male** (māl), ***adj.*** (١) نێرینە؛ نێر؛ نێرە؛ باوکە. (٢) بەهێز. (٣) پیاوانە. (٤) هی پیاوان؛ لە کوڕو پیاو پێکهاتوو: ***(a ~ choir)***. (٥) (ا) هی نێرەك؛ نێرە؛ هی ئەندامی نێرینەی گوڵ. (ب) نێرەکی؛ نێرەك هەڵگر؛ نێرەکدار: ***(~ flowers)***. (٦) نێرە (مەکینەناسی)؛ دەکرێت بە کوندا (سویچی کارەبا، بۆری...هتد).
***n.*** نێرینەی مرۆڤو گیاندارو ڕووەك.
**malediction** (mal′ə-dik′shən), ***n.*** (١) لەعنەت لێکردن؛ لەعنەت. (٢) بەدگۆیی؛ ناو پیس کردن؛ بەدناوکردن.
**malefaction** (mal′ə-fak′shən), ***n.*** تاوان؛ بەدکاری؛ خراپەکاری؛ خراپە
**malefactor** (mal′ə-fak′tẽr), ***n.*** تاوانبار؛ بەدکار؛ خراپەکار.
**malefic** (mə-lef′ik), ***adj.*** زیانبەخش؛ پیس؛ ماڵ وێرانکەر؛ بەد.
**maleficence** (mə-lef′ə-s′ns), ***n.*** بەدکاری؛ خراپەکاری؛ زیان؛ خراپە
**-maleficent** ***(adj.).***
**malemute, malemiut** (mä′lə-mūt′), ***n.*** = **malamute.**
**malevolence** (mə-lev′ə-ləns), ***n.*** بەدخوازی؛ ناحەزی؛ کینەو بەدخوازی
**malevolent** (mə-lev′ə-lənt), ***adj.*** بەدخواز؛ ناحەز؛ کینە لە دڵ و بەدخواز.
**malfeasance** (mal-fē′z′ns), ***n.*** کارێکی قەدەغە لەلایەن کاربەدەستێکەوە (وەك بەرتیل وەرگرتن).
**malformation** (mal′fôr-mā′shən), ***n.*** شێوان (لەش یا ئەندام)؛ شێوانی ماکزایی؛ بە نارێکی یا ناتەواوی پێکهاتن.
**malformed** (mal-fôrmd′), ***adj.*** شێواو (لەش یا ئەندام)؛ بە شێواوی، نارێکی، یا ناتەواوی پێکهاتوو.
**malfunction** (mal-fuŋk′shən), ***v.i.*** بە باشی ئیش نەکردن (مەکینە، ئامێر)؛ کارنەکردن؛ وەستان:
***(Some of the instruments ~ed.)***
***n.*** بە باشی ئیش نەکردن؛ ناتەواوی؛ کارنەکردن؛ وەستان.
**malice** (mal′is), ***n.*** بەدخوازی؛ ناحەزی؛ ڕق؛ کینە:
***(I bear you no ~.)***
**malicious** (mə-lish′əs), ***adj.*** بەدخواز؛ ناحەز؛ کینەدار؛ پیس؛ ڕقاوی: ***(a ~ person, remark, act, etc.)***.
**malign** (mə-līn′), ***v.t.*** بەدگۆیی کردن؛ ناو پیس کردن؛ بەدناوکردن؛ خراپە ووتن.
***adj.*** (١) بەدخواز؛ ناحەز؛ پیس. (٢) زیانبەخش؛ بەد؛ خراپ.
**-maligner** ***(n.).***
**malignance** (mə-lig′nəns), ***n.*** = **malignancy.**
**malignancy** (mə-lig′nən-si), ***n.*** (١) بەدخوازی؛ کینەو بەدخوایی؛ پیسی؛ ناحەزی. (٢) کوشندەیی (شێرپەنجە، برین)؛ زیانبەخشی. (٣) برینێکی کوشندە (شێرپەنجە)؛ سندان.
**malignant** (mə-lig′nənt), ***adj.*** (١) زۆر بەدخواز؛ زۆر ناحەز؛ زۆر کینەدار. (٢) زۆر زیانبەخش؛ بەد؛ پیس. (٣) کوشندە (شێرپەنجە، سندان، نەخۆشی)؛ سندانی؛ بکوژ؛ پیس
***(a ~ tumor, disease, etc.)***
**-malignantly** ***(adv.).***
**malignity** (mə-lig′nə-ti), ***n.*** (١) زۆر بەدخوازی؛ زۆر ناحەزی؛ ڕقێکی زۆر. (٢) کارێك، هەستێك یا ڕووداوێکی بەدو ناحەزانە. (٣) کوشندەیی (برین)؛ بکوژی.
**malinger** (mə-liŋ′gẽr), ***v.i.*** بە درۆ خۆ نەخۆش خستن (بۆ خۆ دزینەوە لە کار).
**malkin** (mô′kin), ***n.*** [Obs. or British Dial.], (١) ژنی چەپەڵ. (٢) داهۆڵ. (٣) [Scot.]، کەروێشك؛ کەروێشکە کێوی. (٤) پشیلە.
**mall** (môl), ***n.*** (١) (ا) مێکوتی یاری " pall-mall ". (ب) ئەم یارییە. (ج) یاریگای ئەم یارییە. (٢) قەیسەری؛ بازاڕی سەرگیراو. (٣) دووبەینی (ڕێگاوبان، شەقام). (٤) جێی پیاسە؛ ڕێڕەوی دارسێبەراوی بۆ پیاسەکردن.
**mall** (môl), ***n. & v.t.*** = **maul.**
**mallard** (mal′ẽrd), ***n.*** نێرەمراوی؛ سۆنە.
**malleable** (mal′i-ə-b′l), ***adj.*** (١) نەرم (کانزا)؛ چەکوشخۆر. (٢) بە ئاسانی ڕادێت؛ ملدەر؛ نەرم؛ گونجاو.
**-malleability** ***(n.).***
**mallee** (mal′i), ***n.*** (١) جۆرێکە لە یوکالیپتۆسی ئوسترالی. (٢) چڕستان یا بێشەڵانێك لەم درەختە.
**mallemuck** (mal′i-muk′), ***n.*** چەند جۆرە باڵندەیەکی دەریایی گەورەیە وەك قەترەس و فیلمار.
**malleolus** (mə-lē′ə-ləs), ***n.*** ئێسقانی قولەپێ.
**mallet** (mal′it), ***n.*** (١) مێکوت؛ چەکوشی دار. (٢) گورزی مێکوت ئاسای هەندێ یاری وەك " پۆلۆ " .
**malleus** (mal′i-əs), ***n.*** ئێسقانی مێکوتی گوێی ناوەوە.
**mallow** (mal′ō), ***n.*** (١) چەند توخمە ڕووەکێکە هێرۆو لۆکەو بامی دەگرێتەوە. (٢) تۆڵەکە.
**malm** (mäm), ***n.*** (١) جۆرە بەردە قسڵێکی سپی بۆری نەرمە. (٢) [British Dial.]؛ گڵێکی نەرمی تەباشیرییە (خشتی لێ درووست دەکرێ).
**malmsey** (mäm′zi), ***n.*** (١) جۆرە شەرابێکی شیرینی بۆن خۆشە. (٢) ئەو ترێیەی ئەم شەرابەی لێ درووست دەکرێ.
**malnourished** (mal-nûr′isht), ***adj.*** بەدخۆراك؛ گەندەخۆر.
**malnutrition** (mal′nōō-trish′ən, mal′nū-trish′ən), ***n.*** بێ خواردنی؛ بەدخۆراکی؛ کەم خۆراکی؛ گەندەخۆری.
**malodor** (mal-ō′dẽr), ***n.*** بۆنێکی پیس.
**malodorous** (mal-ō′dẽr-əs), ***adj.*** بۆگەن.
**malposition** (mal′pə-zish′ən), ***n.*** باری چەوتی (بەتایبەتی هی ئاوڵەمە لە منداڵداندا).
**malpractice** (mal-prak′tis), ***n.*** (١) خەتاکاری پزیشك لە

چارەکردنی نەخۆشدا بەهۆی گوێ پێ نەدانەوە یا نەزانینەوە (کە دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندنی نەخۆشەکە). (٢) یاسا شکاندن بۆ سوودی خۆ (بەتایبەتی لەلایەن کاربەدەستانەوە).

**malt** (môlt), *n.* (١) جۆی ترشاوی چوکەرەکردوو (بۆ بیرە دروستکردن).
(٢) خواردنەوەیەکە وەك بیرە؛ بیرە.
*v.t.* بیرە دروستکردن لە جۆ
*v.i.* بوون بە بیرە.

**malted milk,** (١) تۆزێکە لە شیری وشك و جۆی ترشاوی چوکەرەکردووی وشك کراوەی هاڕراو پێکدێت.
(٢) خواردنەوەیەکە لەم تۆزەو شیرو دۆندرمە دەکرێت.

**malt liquor,** بیرەو خواردنەوەی تری وەهای لە جۆ دروستکراو؛ خواردنەوەیەکە لە بیرە دەچێ.

**maltose** (môl′tōs), *n.* جۆرێکە لە شەکر (لە جۆی ترشاو دەردێت). (هەروەها پێشی دەووترێ: " **malt sugar** ").

**maltreat** (mal-trēt′), *v.t.* بەدڕەفتاری لەگەڵ کردن؛ خراپ لەگەڵ جوولانەوە.

**-maltreatment** ***(n.).***

**malvasia** (mal′və-sē′ə), *n.* (١) جۆرە ترێیەکە شەرابی- " **malmsey** " ی لێ دروست دەکرێ. (٢) ئەم شەرابە.

**malversation** (mal′vēr-sā′shən), *n.* بەدڕەفتاری کاربەدەست (وەك: دزی، بەرتیل وەرگرتن... هتد)

**mamma, mama** (mä′mə), *n.* (١) دایك (وشەی منداڵانە)؛ دایە.
(٢) [Slang]، ژنێکی جوان و پان و پۆڕو شەهوانی و هەوەس هەڵسێنەر.

**mamma** (mam′ə), *n.* مەمك؛ مەمە؛ گوان.

**mammal** (mam′əl), *n.* شیردەر؛ مەمکدار؛ گواندار.

**mammalian** (ma-mā′li-ən), *adj.* شیردەر؛ مەمکدار؛ گواندار.
*n.* = **mammal.**

**mammalogy** (ma-mal′ə-ji), *n.* مەمکدارناسی؛ گواندارناسی؛ زانستی شیردەرەکان.

**mammary** (mam′ə-ri), *adj.* مەمکی؛ گوانی؛ تایبەت بە مەمك یا گوان.

**mammary gland,** ئەندامی شیردەر؛ لووی شیردار.

**mammiferous** (ma-mif′ēr-əs), *adj.* مەمکدار؛ گواندار.

**mammilla** (ma-mil′ə), *n.* گۆی مەمك؛ گۆی گوان

**mammillate** (mam′ə-lāt′), *adj.* (١) گۆدار
(٢) لە گۆی مەمك دەچێ.

**mammock** (mam′ək), *n.* پارچە؛ کەرت؛ کوت؛ لەت.
*v.t.* کوت کوت کردن؛ پارچە پارچە کردن.

**mammon** (mam′ən), *n.* (١) [M-] ، خوا درۆزنەی سامان و چاوبرسێتی؛ شەیتانی سامان پەرستی و چاوبرسێتی
(٢) سامان (لەڕووی خراپییەوە چونکە دەپەرسترێت).

**mammonism** (mam′ən-iz′m), *n.* سامان پەرستی و چاوبرسێتی؛ زێڕ پەرستی.

**mammoth** (mam′əth), *n.* (١) جۆرە فیلێکی قڕتێکەوتووە.
(٢) شتێکی ئێجگار زۆر گەورە.
*adj.* زەڤەلاح؛ زۆر گەورە؛ فیلەتەن؛ ئێجگار زۆر گەورە؛ زەبەلاح.

**mammy** (mam′i), *n.* (١) دایك (وشەی منداڵانە بە هەمان مانای- " **mamma** " ؛ دایە. (٢) ژنە قولەڕەشی لەلەی منداڵی سپی یا کارەکەرێکی کۆنی ماڵێك (بەتایبەتی لە ناوچەی خوارووی ئەمەریکا).

**man** (man), *n.* (١) مرۆڤ؛ ئادەمیزاد.
(٢) مرۆڤایەتی؛ ئادەمیزادان؛ خەڵك؛ توخمی ئادەمیزاد.
(٣) (ا) پیاو؛ کوڕ؛ نێرینە؛ نێر. (ب) کابرا؛ زەلام؛ کەس.
(٤) (ا) پیاو؛ بەردەست؛ ڕاگرتە؛ نۆکەر.
(ب) کرێکار؛ مووچەخۆر: ***( The employer talked to his ~ .)*** .
(ج) ***(pl.)***، سەرباز (هەموو جۆرێك): ***( officers and men)*** .
(د) [Archaic]، بەندە؛ مسکێن؛ ڕەنجبەر.
(٥) (ا) مێرد: ***( They are ~ and wife.)*** .
(ب) دۆست؛ دڵدار؛ یار.
(٦) مەرد؛ نێر؛ پیاو؛ ئازا. (٧) پیاوەتی؛ مەردایەتی.
(٨) ئەندامی تیپ (وەرزش یا پرۆژە). (٩) پارچەی شەترەنج و دامە.
(١٠) کەشتی (لە وشەی پەیوەستیدا وەك: " **merchantman** " ؛ " **man-of-war** ").
*v.t.* (١) پیاو خستنەسەر (کار، بەرگری، سەرەوکاری): ***( They ~ned the ship, barricades, tables, etc.)***
(٢) جێی خۆ گرتن (کار، بەرگری): ***( M~ the guns!)*** .
(٣) خۆ گورج کردنەوە؛ بەهێزکردن: ***( He ~ned himself for the ordeal.)***
*interj.* [Slang], وشەیەکە خۆشی و سەرسامی دەردەبڕێ: ***( Oh, ~ ! ; M~, what a sight!)***
*adj.* نێر؛ نێرینە.
**as a ( or one ) man,** پێکەوە؛ هەموو پێکەوە.
**be one's own man,** سەربەست؛ لە ژێر دەستی کەسدا نەبوون؛ بە هەوەسی خۆ شت کردن.
**man and boy,** لە منداڵیشدا و لە گەورەییشدا.
**to a man,** هەموویان؛ هەمووکەس؛ دوایەکیان.

**-man** (mən, man), پاشگرێکە بەمانای: کەس؛ پیاو؛ مرۆڤ:
(ا) خەڵکی وڵاتێکی تایبەتی: ***( Englishman, Frenchman)*** .
(ب) پیشەگەر: ***( laundryman)*** .
(ج) مەکینەچی؛ لێخوڕ یا بەکارهێنەری مەکینەیەك: ***( motorman)*** .

**mana** (mä′nä), *n.* هێزو دەسەڵاتی لە سرووشت بەدەر؛ هێزی خودایانە؛ هێزی ئەفسوونیی.

**manacle** (man′ə-k'l), *n.* (١) ***(pl.)*** ، کەلەپچە.
(٢) ڕاگیرکەر؛ ڕاگر؛ بەستەرەوە.
*v.t.* (١) کەلەپچەکردن. (٢) ڕێ لێگرتن؛ بەستنەوە؛ ڕاگیرکردن؛ ڕاگرتن.

**manage** (man′ij), *v.t.* (١) ڕاهێنان (ئەسپ)؛ مەشق پێکردن.
(٢) بەڕێوەبردن؛ هەڵسووڕاندن؛ سەرەوکاری کردن؛ گێڕان: ***( to ~ a hotel, restaurant, household, etc.)***
(٣) [Rare]، دەست پێوەگرتن (پارە، ئازووقە)؛ بەفیڕۆنەدان.
(٤) هێنانە ژێربارەوە؛ ماڵی کردن؛ مل پێدان.
(٥) بەجێهێنان؛ سەرکەوتن لە کارێکدا (بەتەوسەوە).
*v.i.* (١) بەڕێوەبردن؛ سەرەوکاری کردن؛ هەڵسووڕاندن.
(٢) دەربردن؛ هەڵکردن: ***( I don't know how but I'll ~ .)*** .
*n.* [Archaic], (١) **manége** . (٢) بەڕێوەبردن؛ بەڕێوەبەرایەتی.

**manageable** (man′ij-ə-b'l), *adj.* دایین دەکرێ؛ بەڕێوەدەبرێ؛ دەکرێت؛ جێبەجێ دەکرێت.

**-manageability** ***(n.).***

**management** (man′ij-mənt), *n.* (١) بەڕێوەبردن؛ هەڵسووڕاندن.
(٢) توانای بەڕێوەبردن؛ لێهاتوویی بەڕێوەبردن.
(٣) بەڕێوەبەرایەتی؛ دەستەی بەڕێوەبەرایەتی یا بەڕێوەبەران: ***( the hotel ~ ; Labor and ~ failed to agree on wages.)***

**manager** (man′ij-ēr), *n.* (١) کارگێڕ؛ بەڕێوەبەر (میوانخانە، چێشتخانە، دەزگای بازرگانی و پیشەسازی)؛ سەرکار.
(٢) بەڕێوەبەری لێهاتووی دەستگر بە پارەوە.
(٣) بەڕێوەبەری تیپی وەرزش.
(٤) بەڕێوەبەری کاروباری گۆرانی بێژێك یا سەماکەرێك.

**managerial** (man′ə-jêr′i-əl), *adj.* بەڕێوەبەری؛ بەڕێوەبردن: ***( ~ skills, positions, duties, etc.)***

**managership** (man′ij-ēr-ship′), *n.* پلەوپایەو ئەرکی بەڕێوەبەر؛ بەڕێوەبەرایەتی.

**manakin** (man′ə-kin), *n.* (١) چەند توخمە باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگی

بچووکە (٢) **manikin** .

**mañana** (mä-nyä′nä), *n.* [Sp.], سبەینێ

***adv.*** (١) سبەینێ (٢) هەرکاتێك ڕێکەوت لەمەودوا (ئەم ووتەیە ئەوە دەگەیەنێ

کە پێویست ناکات پەلە لە کارەکە بکرێ‌و خوا گەورەیە هەرکات کرا دەکرێت).

**man-at-arms** (man′ət-ärmz′), *n.* سەرباز. بەتایبەتی یەکێکی

سوارەی پڕچەك لە سوپای سەدەی ناوەڕاستدا.

**manatee** (man′ə-tē′), *n.* مانگای دەریا: گیاندارێکی دەریایی

گیاخۆری گەورەی ناوچە گەرمەکانە

**manchet** (man′chit), *n.* نانی گەنمی نایاب.

**man-child** (man′chīld′), *n.* کوڕ: منداڵی نێرینە.

**manchineel** (man′chi-nēl′), *n.* (١) درەختێکی ناوچەی گەرمی

ئەمەریکییە شیلەو بەری ژەهراوی هەیە ( بەرەکەی لە سێو دەچێ).

(٢) دارو تەختەی ئەم درەختە.

**manciple** (man′si-p'l), *n.* قۆنتەراتچی ئازووقە (پەرستگا،

دانشگای ئینگلیزی... هتد).

**mandala** (man′də-lə), *n.* مەندەلە کلێشەیەکی خڕی نەخشدارە

نیشانەی گەردوونە (ئاینی بوودی).

**mandamus** (man-dā′məs), *n.* فەرمانی دادگای بەرز.

***v.t.*** فەرمانێکی وەها بۆ دەرکردن.

**mandarin** (man′də-rin), *n.* (١) کاربەدەستی بەرزی چینی لەکاتی

پادشایەتیدا (٢) [M-]، شێوەزمانی چینی ڕەسمی‌و چینە ڕۆشنبیرو بەرزەکان.

(٣) (ا) لاەنگی (ب) دار لەلانگی. (ج) هەندێ درەختی هەمان توخم.

(٤) ڕەنگی پرتەقاڵی تۆخ.

(٥) (ا) جۆرە چاکەتێکی چینییە. (ب) جۆرە چاکەتێکی ژنانەی چینییە.

***adj.*** تایبەتی بەم چینە بەرزانەی چین: ڕێك‌وپێك‌و جوان‌و باش‌و ئاسانە (زمان،

خواردەمەنی، شێواز... هتد)

**mandarin duck,** جۆرە مراوییەکی ڕەنگاوڕەنگی پۆپنەدارە.

**mandatary** (man′də-ter′i), *n.* (١) وولاتێکی دەسەلات پێدراو بۆ

بەڕێوەبردنی وولاتێك یا ناوچەیەکی بێگانە.

(٢) [Rare]، کەسێکی دەسەلات پێدراو بۆ کردنی شتێك.

**mandate** (man′dāt), *n.* (١) فەرمان (بەتایبەتی هی نووسراو)؛

دەسەلات (٢) (ا) ئەو فەرمانەیە کە کۆمەڵی نەتەوەیەکگرتووەکان دای بە هەندێ

لە وولاتە ئەندامەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم بۆ بەڕێوەبردنی هەندێ

وولات‌و ناوچەی ژێردەستەی بێگانە (وەك لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا).

(ب) ناوچە یا وولاتێکی وەها بەڕێوەبراوی ژێردەستە.

(٣) دەسەلاتێکی گشتی یا فەرمانێکە کە گەل دەیدات بە یەکێك لە نوێنەرەکانی

(وەك سەرکۆمار یا ئەندامی پەرلەمان) بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەیەك.

(٤) فەرمانێکی دادگایی یا پاپایی.

***v.t.*** پێ سپاردن یا خستنە ژێر دەستی ناوچەیەك بە وولاتێك بۆ بەڕێوەبردنی

سەردەمی بەڕێوەبردنی ناوچەیەکی ژێردەستەی وەها.

**mandator** (man-dā′tēr), *n.* دەسەلات پێدەر

**mandatory** (man′də-tôr′i, man′də-tō′ri), *adj.* (١) زۆرەکی؛

بەزۆر فەرمانی: ***( Military service is ~ in some countries.)*** .

(٢) تایبەتی بە دەسەلات‌و فەرمانی بەڕێوەبردنی ناوچەیەکی ژێردەستە.

(٣) فەرمان پێدراوی بەڕێوەبردنی ناوچەیەکی ژێردەستە.

**mandible** (man′də-b'l), *n.* (١) شەویلکی خواروو.

(٢) لاخواروی دەنووك یا لاسەرووی. (٣) دەمی جانەوەر.

**mandibular** (man-dib′yoo-lēr), *adj.* شەویلکەیی؛ کاژێری.

***n.*** ئێسقانی کاژێری خواروو.

**mandibulate** (man-dib′yoo-lit), *adj.* (١) شەویلکدار

(٢) خواردەمەنی پێ دەجوورێ.

***n.*** جانەوەری شەویلکدار.

**mandolin** (man′d'l-in′, man′də-lin′), *n.* ماندۆلین ئامێرێکی

مۆسیقایی ژێدارە لە عوود دەچێ.

**mandrake** (man′drāk), *n.* (١) گیا ئادەمە گیایەکی ژەهراوییە

ڕەگەکەی بۆ دەرمان بەکاردەهێنرێ.

(٢) ڕەگی ئەم ڕووەکە کە لە کۆندا وا دەزانرا شێوەی لە ئادەمیزاد دەچێ.

**mandrel, mandril** (man′drəl), *n.* (١) تەوەرێکی چەسپیوە

شتی پێوە قایم دەکرێ لەکاتی بڕینەوەو ڕێك‌وپێك کردنیدا.

(٢) قاڵبێکی لوولەییە شتی بەدەوردا دادەڕێژرێ.

**mandrill** (man′dril), *n.* مەیموونێکی زل دڕی ڕۆژاوای ئەفریقایە.

**mane** (mān), *n.* (١) یاڵ (ئەسپ، ماین، شێر، گامێشی ئەمەریکی).

(٢) پرچ؛ پرچی درێژو پڕ.

**man-eater** (man′ēt′ēr), *n.* (١) پیاوخۆر؛ گۆشتی ئادەمیزاد خۆر

(ئادەمیزاد). (٢) گیاندارێکی ئادەمیزادخۆر، بەتایبەتی: (ا) هەندێ کۆسە.

(ب) شێرو پڵنگێك کە حەز لە گۆشتی ئادەمیزاد دەکەن.

**manège, manege** (ma-nezh′, mə-nāzh′), *n.* (١) سوارچاکی؛

ئەسپ سواری‌و مەشق پێکردنی ئەسپ.

(٢) ڕەوت‌و خۆنوواندنی ئەسپی مەشق پێکراو.

(٣) ئەسپی سوارچاکی (بۆ مەشق پێکردنی ئەسپ‌و خەڵك فێری سواری کردن).

**manes, Manes** (mā′nēz), *n.pl.* (١) گیانی باوو باپیرانی مردوو

کە بە خودا دادەنران (ئاینی کۆنی ڕۆمان).

(٢) گیان یا خێوی مردووی زۆر بەڕێز.

**maneuver, manoeuvre** (mə-nōō′vēr, mə-nū′vēr), *n.*

(١) (*pl.*)، مناوەرەی سوپایی؛ مەشقی تایبەتی لەشکر.

(٢) پیلان؛ فێڵ‌وتەڵەکە؛ مناوەرە:

***( The child tried various ~s to get his way.)***

***v.i. & v.t.*** (١) مناوەرە بە لەشکرکردن.

(٢) پیلانی زۆرزانانە دانان؛ پیلان گێڕان؛ بە فێڵ ئامانجی خۆ هێنانەدی؛

مناوەرەکردن:

***( He ~ed his way to victory.; She ~ed herself out of an embarrassing position.)***

**maneuverable** (mə-nōō′vēr-ə-b'l), *adj.* مناوەرەی پێ دەکرێ؛

بە ئاسانی پێچی پێ دەکرێتەوەو لێ دەخوڕێ؛

بە ئاسانی دەجوولێنرێ‌و دەگۆڕدرێ.

-maneuverability *(n.)*.

**man Friday,** بەردەست، یاریدەدەر، یا شاگردێکی دڵسۆزو لێهاتوو.

**manful** (man′fəl), *adj.* مەرد؛ ئازا؛ پیاو؛ بەزەبر؛ بەوورە.

**manganese** (maŋ′gə-nēs′, maŋ′gə-nēz′), *n.* مەنگەنیز.

**manganic** (man-gan′ik, maŋ-gan′ik), *adj.* مەنگەنیزی.

**manganous** (maŋ′gə-nəs, man-gan′əs), *adj.* مەنگەنیزی.

**mange** (mānj), *n.* گەڕی (گیانەوەرو مرۆڤ)؛ کەچەڵی.

**mangel-wurzel** (maŋ′g'l-wūr′z'l), *n.* جۆرە چەوەندەرێکی

گەورەیە دەدرێ بە ڕەشەووڵاخ.

**manger** (mān′jēr), *n.* ئاخوڕ.

**mangle** (maŋ′g'l), *v.t.* (١) پێست‌و لەش شین کردنەوەو شێواندن‌و

بریندارکردن‌و کوتانەوە: ***( The body was ~d beyond recognition.)*** .

(٢) تێکدان (لەڕووی نەزانینەوە)؛ شێواندن: ***( to ~ a speech, text, etc.)*** .

**mangle** (maŋ′g'l), *n.* (١) ئامێری لە ئوتوودانی قوماش‌و جل‌وبەرگ.

(٢) [Chiefly British]، ئامێری جل گوشین.

**mango** (maŋ′gō), *n.* (١) مانگۆ: میوەیەکی ترۆپیکی ڕەنگ زەردو

سووری گۆشتنی پێست ئەستووری ناوك ڕەقە بە گەیوی دەخورێ‌و بە کاڵی

دەکرێ بە " عەنبە " . (٢) درەختی ئەم میوەیە.

**mangonel** (maŋ′gə-nel′), *n.* ئامێرێکی جەنگی بەردهاوێژی کۆنە.

**mangosteen** (maŋ′gə-stēn′), *n.* (١) میوەیەکی ترۆپیکی ترش‌و

شیرینی گۆشتنی پێست ئەستووری پرتەقاڵییە.

(٢) درەختی ئەم میوەیە.

**mangrove** (maŋ′grōv), *n.* جۆرە دارو دەوەنێکی هەمیشە سەوزی

ناوچە گەرمە زەلکاوییەکانە لقەکانیشی ڕەگی لێ دەبێتەوە.

**mangy** (mān′ji), *adj.* (١) گەڕ؛ کەچەڵ.

(٢) دڕاو (جل‌وبەرگ)؛ شڕ: *(a ~ old coat)*.
(٣) پەڕپووت: کەلاوەیی؛ کۆن‌و پیس‌وپۆخڵ‌و ناخۆش:
*(a ~ apartment building)*

**manhandle** (man'han'd'l, man'han'd'l), *v.t.* [Rare] (١) بە دەست جووڵاندن نەك بە مەکینە. (٢) بە توندوتیژی لەگەڵ جووڵانەوە؛ دانەبەر تەکان‌و پاڵ پێوەنان‌و ڕاپسکان.

**manhattan** (man-hat'ən), *n.* جۆرە خواردنەوەیەکی تێکەڵاوی سەرخۆشکەرە (لە ویسکی‌و ڤەرمووس دەکرێت).

**manhole** (man'hōl'), *n.* کونی لێوە چوونە ناو زێراب‌و بۆری ژێرزەمین (بۆ کار تێداکردن).

**manhood** (man'hood), *n.* (١) کاتی پیاوەتی؛ تەمەنی پیاوەتی.
(٢) پیاوەتی: مەردایەتی؛ ئازایەتی.
(٣) پیاوان: پیاو.

**manhour** (man'our'), *n.* کاری سەعاتانە: بریتی‌یە لە پێوانەیەکی بەرهەمی سەعاتانەی کارێك.

**manhunt** (man'hunt'), *n.* بەدواداگەڕانی تاوانبارێك بەتوندی (لەلایەن پۆلیسەوە)

**mania** (mā'ni-ə), *n.* (١) شێتی: شێتی‌و بێ ئارامی؛ دێوانەیی؛ شێتەپەتەڕێتی (٢) خولیا: *(a ~ for collecting stamps)*.

**-mania** (mā'ni-ə), پاشگرێکە بەمانای خولیا؛ شەیدایی:
*(kleptomania)*

**maniac** (mā'ni-ak'), *adj.* شێتەپەتەڕی: دێوانە؛ شێتێکی تەواو.
*n.* کەسێکی شێتەپەتەڕی.

**manic** (man'ik, mā'nik), *adj.* شێتەپەتەڕی: شەیدا؛ دێوانە.

**manic-depressive** (man'ik-di-pres'iv), *adj.* شەیداو پەست بەنۆرە؛ بەنۆرە جارێك زۆر بە کەیف‌و جارێك زۆر پەست‌و دڵتەنگ (دەروونناسی)
*n.* کەسێکە کە بەنۆرە جارێك شێت‌و شەیدایە لە خۆشیداو جارێك زۆر پەست‌و دڵتەنگ (دەروونناسی)

**Manicheism, Manichaeism** (man'ə-kē'iz'm), *n.* بیرو- باوەڕێکی ئاینی‌یە بریتی‌یە لە بڕوابوون بە ناکۆکی نێوان باشی (ڕووناکی، خودا، گیان) و خراپی (تاریکی، شەیتان، لەش).
-**Manichean; Manichaean** *(n. & adj.)*.

**manicure** (man'ə-kyoor'), *n.* نینۆك کردن‌و بۆیەکردنیان.
*v.t. & v.i.* نینۆك کردن‌و بۆیەکردنیان.

**manicurist** (man'ə-kyoor'ist), *n.* ژنێکە پیشەی نینۆك کردن‌و بۆیەکردنیانە

**manifest** (man'ə-fest'), *adj.* دیار؛ ئاشکرا؛ ڕوون.
*v.t.* (١) دەرخستن؛ ئاشکراکردن؛ پیشاندان؛ ڕوونکردنەوە.
(٢) سەلماندن: ساغ کردنەوە. (٣) (ا) لە بارنامەی کەشتیدا تۆمارکردن.
(ب) بارنامە پیشاندان.
*v.i.* دەرکەوتن: هاتنەڕوو.
*n.* (١) بارنامەی کەشتی‌و فڕۆکە (بارو ڕێبوار).
(٢) گواستنەوەی خواردەمەنی زوو لەناوچوو بەهۆی هاتوچۆی خێراوە.
(٣) [Obs.] ا) نیشانە. (ب) بەیاننامە.

**manifestant** (man'ə-fes'tənt), *n.* بەشداربووی خۆپیشاندانێك؛ خۆپیشاندەر

**manifestation** (man'ə-fes-tā'shən), *n.* (١) دەرخستن: دەرکەوتن؛ پیشاندان؛ هاتنەڕوو؛ خستنەڕوو.
(٢) نیشانە: *(His silence was a ~ of cowardice.)*.
(٣) خۆپیشاندان.

**manifesto** (man'ə-fes'tō), *n.* بەیاننامە (بەتایبەتی یەکێکی ڕامیاری گرنگ دەربارەی بیروباوەڕو ئامانج).
*v.i.* بەیاننامە دەرکردن.

**manifold** (man'ə-fōld'), *adj.* (١) لە گەلێك بەش‌و چەشن‌و تایبەخۆ پێکهاتوو: *(~ wisdom)*.
(٢) فرەجۆر؛ جۆراوجۆر؛ زۆرو جیاجیا؛ جۆرەها: *(~ duties)*.
(٣) گەلێك جار؛ چەندەها جار: *(a ~ villain)*.
(٤) گەلێك بەشی مەکینەیەك کارپێدەکات لە هەمان کاتدا.
*n.* (١) شتێکی جۆراوجۆر یا فرەبەش. (٢) وێنەی دەقاودەق.
(٣) بۆرییەك کە چەند بۆرییەکی لقی لێ دەبێتەوە (مەکینەی ئوتومبیل).
*v.t.* (١) گەلێك وێنە لێ دەرهێنان: *(to ~ a letter)*.
(٢) فرەکردن؛ زۆرکردن؛ چەندەها جارکردن.

**manifolder** (man'ə-fōl'dēr), *n.* مەکینەی وێنەی دەقاودەق دەرهێنان.

**manikin, mannikin** (man'ə-kin), *n.* (١) کورتەبالا؛ بستەبالا؛ کوڵەبنە. (٢) پەیکەرێکە لە شێوەی ئادەمیزاددا بۆ لێکۆڵینەوە لە زانستگای پزیشکەوانیدا بەکاردەهێنرێ. (٣) **mannequin**.

**man in the street,** کەسێکی ئاسایی؛ بۆرەپیاو.

**manioc** (man'i-ok', mā'ni-ok'), *n.* (١) ڕووەکێکی ترۆپیکی‌یە ڕەگەکەی دەخورێ. (٢) نیشاستەی دەرهێنراو لەم ڕەگە.

**maniple** (man'ə-p'l), *n.* (١) دەستەی سوپای ڕۆمانی کۆن (بریتی‌یە لە ٦٠ یا ١٠٠ کەس). (٢) باڵبەستی کاتی خوانی خودایی (خاچ پەرستی).

**manipulate** (mə-nip'yoo-lāt'), *v.t.* (١) بە دەست خستنەکار؛ بە دەست بەکارهێنان بە کارامانە؛ بەکارهێنان. (٢) بەکارهێنان بە زیرەکانە بۆ مەبەست‌و سوودی خۆ؛ کارتێکردن بۆ سوودو مەبەستی خۆ:
*(A clever politician knows how to ~ his supporters. She always tries to ~ him.)*
(٣) دەستکاری کردن بۆ سوودو مەبەستی خۆ؛ ساختەکردن (ژمێریاری، نرخ، تۆمارنامە): *(to ~ accounts)*.
-**manipulative; manipulatory** *(adj.)*; **manipulator** *(n.)*.

**manipulation** (mə-nip'yoo-lā'shən), *n.* (١) بە دەست بەکارهێنان بە کارامانە. (٢) بەکارهێنان‌و دابینکردن بە زیرەکانە بۆ سوودی خۆ.
(٣) دەستکاری کردن یا ساختەکردن بۆ سوودی خۆ (ژمێریاری، نرخ).

**manito, manitou, manitu** (man'ə-tō'), *n.* خودا یا هێزی سرووشتی باش‌و خراپ (لای هیندی‌یە سوورەکانی ئەمەریکا).

**mankind** (man'kīnd'), *n.* (١) توخمی ئادەمیزاد؛ ڕەگەزی مرۆڤ؛ هەمووکەس. (٢) پیاوان؛ نێرینە.

**manlike** (man'līk'), *adj.* (١) لە پیاو دەچێ؛ شێوەی لە پیاو دەکات.
(٢) پیاوانە؛ بۆ پیاو شیاو؛ بۆ پیاو باشە.

**manliness** (man'li-nis), *n.* پیاوەتی؛ ئازایەتی؛ مەردایەتی.

**manly** (man'li), *adj.* (١) مەرد؛ بەهێز؛ پیاو؛ ئازا؛ نێر.
(٢) پیاوانە؛ تایبەتی بە پیاو یا پیاوان؛ هی پیاو: *(~ sports)*.
*adv.* مەردانە؛ ئازایانە؛ پیاوانە.

**man-made** (man-mād'), *adj.* دەستکرد؛ مرۆڤ کرد.

**manna** (man'ə), *n.* (١) گەزۆ؛ مەن (کە بۆ جوولەکە داباری بەپێی ئینجیل). (٢) خۆراکێکی گیانی، دڵخۆشی‌یەك، یا یارمەتی‌یەك کە وەك لە ئاسمانەوە باری بێت وابێت. (٣) شیلەی دارەڕەشێکی ئەورووپایی‌یە دەکرێ بە دەرمانی ڕەوانی.

**mannequin** (man'ə-kin), *n.* *Also* **manikin,** (١) پەیکەری جل‌وبەرگ نوواندنی فرۆشگا. (٢) مۆدێل: ئافرەتێکە پیشەی لەبەرکردنی جل‌و بەرگی تازەباوە بۆ نوواندنی لە پیشانگاو فرۆشگادا.

**manner** (man'ēr), *n.* (١) شێوەی کردنی شتێك؛ شێواز:
*(Do it in this ~.)*
(٢) (ا) ڕەووشت؛ شێوەی هەڵسان‌و دانیشتن:
*(He has an awkward ~.; His ~ showed his anger.)*
(ب) ڕەووشتی جوان؛ خووی جوان؛ سەلاری: *(She has ~.)*.
(٣) خوو؛ نەریتی تایبەتی کەسێك (لە قسەکردن یا ڕەفتارکردندا):
*(It is his ~ to be sarcastic.)*
(٤) *(pl.)*، (ا) نەریتی کۆمەڵایەتی.

(ب) رەووشت؛ خوو: *( good ~s; bad ~s)* .
(٥) شێوازی تایبەتی هونەرو مۆسیقاو وێژە.
(٦) [Archaic or Literary]، جۆر:
***( What ~ of man is he? all ~ of things)***
**by all manner of means,** بێ گومان
**by no manner of means,** بە هیچ جۆرێك؛ بە هیچ شێوەیەك.
**in a manner of speaking,** تا رادەیەك؛ دەتوانیت وا بڵێیت.
**to the manner born,** لە پشتاو بشتەوە بۆی ماوەتەوە؛
لە زگماکییەوە فێرە؛ بە بنەچە وەهان؛ لێی دێت.
**mannered** (man′ērd), *adj.* (١) رەووشتی تایبەتیدار؛
خووی تایبەتیدار: *( ill- ~ ; well- ~ )* .
(٢) ناسرووشتی؛ خۆنوێنەر؛ خۆبادەر؛ بەپۆز.
**mannerism** (man′ēr-iz′m), *n.* (١) خووی تایبەتی زۆر لەبەرچاو
(لە قسەکردن یا رەفتاردا کە کەسێکی پێ ناسراوەو پێ دەناسرێتەوە).
(٢) لە رادە زیاتر بەکارهێنانی شێوازێکی تایبەتی لە هونەرو وێژەو دووانو
رەفتاردا
**mannerless** (man′ēr-lis), *adj.* بەدرەووشت؛ بەدخوو؛
بێ رەووشت؛ رەووشت ناشرین.
**mannerly** (man′ēr-li), *adj.* رەووشت جوان؛ ناسك.
***adv.*** بە جوانی؛ بە ناسکی؛ بە شێوەیەکی جوان؛ بە رەووشت جوانی.
**-mannerliness *(n.).***
**mannikin** (man′ə-kin), *n.* = manikin.
**mannish** (man′ish), *adj.* (١) کورانی (بە کچێك یا ژنێك دەوترێ
لەڕووی سووکییەوە)؛ ژنە کورانی: *( her ~ clothes and behavior)* .
(٢) پیاوانە؛ بۆ پیاو شیاو؛ لە پیاو هاتوو.
**mannite** (man′īt), *n.* = mannitol.
**mannitol** (man′ə-tōl′, man′ə-tol′), *n.* مانیتۆل ماددەیەکی
کحول شیرینە لە گەلێك رووەکدا هەیە بۆ خۆراكو تاقیکردنەوەی کاری گورچیلە
بەکاردێت
**mannose** (man′ōs), *n.* مانۆز جۆرە شەکرێکە لە ئۆکسیدکردنی
" مانیتۆل " پێکدێت.
**manoeuvre** (mə-nōō′vēr, mə-nū′vēr), *n., v.i. & v.t.* -
**maneuvre.**
**man of God,** (١) خوداناس؛ ئایندار؛ پیرۆز؛ سۆفی؛ قەلەندەر.
(٢) قەشە؛ مەلا؛ مالووم.
**man of the world,** کەسێکی تێگەیشتوو و دنیادیدە؛ زانا؛
کەسێکی چاوکراوە.
**man-of-war** (man′əv-wôr′, man′ə-wôr′), *n.* کەشتی جەنگ.
**manometer** (mə-nom′ə-tēr), *n.* (١) پێوەری پەستانی گازو هەڵم؛
پەستان پێو. (٢) پێوەری پەستانی خوێن.
**manor** (man′ēr), *n.* (١) (ا) دەرەبەگ نشین؛ ناوچەی سەر بە دەرەبەگ.
(ب) کۆشکی دەرەبەگی ناوچەیەکی وەها. (٢) زەوی‌وزارو کێڵگەی دەرەبەگ.
(٣) کۆشکی ناو زەوی‌وزار
(٤) زەوی بە کرێ گیراو (لە سەرەتای دروستبوونی ئەمەریکادا).
**manor house,** کۆشکی دەرەبەگ؛ کۆشکی خاوەن زەوی‌وزار (لەناو
زەوی‌وزارەکەدا).
**manpower** (man′pou′ēr), *n.* (١) هێزی باهووبازوو؛
هێزی ئادەمیزاد (بۆ کارکردن). (٢) سەرجەمی کرێکاران یا فەرمانکەرانی
ناوچەیەك یا وولاتێك کە پێویست بێت بۆ جێبەجێکردنی کارێك.
**manqué** (män′kā′), *adj.* سەرنەکەوتوو؛ بە ئامانج نەگەیشتوو؛
ناتەواو: *( a poet, artist, Napoleon, ~ )* .
**manrope** (man′rōp′), *n.* گوریسی پەیژەو قەراغی پێ پلیکانەی
کەشتی (بۆ دەست پێوەگرتن).
**mansard** (man′särd), *n.* (١) سەربانێکە هەموو دیوەکانی لە دوو
بەش پێکهاتووە بەشی ژێرەوەی لێژترە. (هەروەها " mansard roof " ) .

(٢) خانەی ژێر ئەم سەربانە.
**manse** (mans), *n.* (١) خانە یاماڵی قەشە (بەتایبەتی ئوسکوتلەندی).
(٢) [Obs.]، (ا) mansion . (ب) ئەوەندە زەوی‌وزار کە خێزانێك گوزەرانی
پێ بکات.
**manservant** (man′sūr′vənt), *n. Also* **man servant,**
بەردەست؛ خزمەتکار؛ خزمەتچی.
**mansion** (man′shən), *n.* (١) کۆشك؛ خانوویەکی گەورەو خۆش.
(٢) کۆشکی دەرەبەگ. (٣) [Archaic]، ماڵ؛ خانە؛ خانوو.
(٤) یەکێك لە بیست‌وهەشت خولگەکەی مانگ
**man-sized** (man′sīzd′), *adj.* پیاوانە؛ بۆ پیاو دەشێ؛
هەر بە پیاو دەکرێ؛ زل؛ گەورە: *( a ~ job, piece of pie, model, etc.)* .
**manslaughter** (man′slô′tēr), *n.* پیاوکوشتن بە نارەوا، بەڵام
بەبێ کینەو بێ دەستقەست؛ مرۆڤ کوشتن بە رێکەوت.
**manslayer** (man′slā′ēr), *n.* پیاوکوژ بە دەستقەست یا
بێ دەستەنقەست.
**mansuetude** (man′swi-tōōd′, man′swi-tūd′), *n.* سەرکزی؛
ملکەچی؛ بەسزمانی.
**manta** (man′tə), *n.* (١) قوماشێکی لۆکەی هەرزانبەهایە (بۆ دەستماڵو
شتی وەها). (٢) دەستماڵ. (٣) سەرەخەری بار. (٤) devilfish
**manteau** (man′tō), *n.* (١) (ا) عەبای ژنانە. (ب) عەبا.
(٢) [Obs.]، کراسی دەڵبی ژنانە.
**mantel** (man′t'l), *n.* رەفە یا لێواری سەر ئاگردانی ناو دیوار.
**mantelet** (man′t'l-et′, mant′lit), *n.* (١) عەبای کورتی بێ قۆڵی
دەڵپ. (٢) (ا) قەڵغان یا زرێی سەربازی هێرشبەر.
(ب) زرێی تۆپ هاوێژ.
**mantelletta** (man′tə-let′ə), *n.* عەبای سەرەك قەشەو کاردینالی
کاسۆلیکی.
**mantelpiece** (man′t'l-pēs′), *n.* = mantel.
**mantic** (man′tik), *adj.* پێشبینیکەر؛ نوقلانەلێدەر.
**mantilla** (man-til′ə), *n.* (١) سەرپۆش (بەتایبەتی کە ئافرەتی
ئیسپانیی و مەکسیکی دەیدەن بەسەریاندا). (٢) دەستماڵ؛ عەبای کورت
**mantis** (man′tis), *n.* کوللەحاجی.
**mantle** (man′t'l), *n.* (١) کەوا؛ عەبا.
(٢) پۆشەنی؛ پۆشاك؛ سەرەخەر؛ داپۆشەر. (٣) mantel .
(٤) دیوی دەرەوەی دیوار. (٥) هەوای گەرمی دەورویشتی گڕە ئاگر.
(٦) تۆڕی لۆکس (کە رووناکی دەداتەوە لەکاتی داگیرساندا).
(٧) دیواری فڕنی کانزا تواندنەوە. (٨) قەپاغی مێشك.
(٩) چینی سەرەوەی زەوی.
(١٠) پەردەی پێستی نێوان لەشو قاوغ لە گوێچکەماسیی و هەندێ گیانداری
قاوغداری تردا کە بە بەردی کەنارەدەریاوە دەنووسێن.
***v.t.*** (١) پۆشین؛ داپۆشین؛ شاردنەوە:
***( All the high points about the valley were ~d in fresh snow.)***
(٢) عەبا بەسەردا دان؛ کەوا لەبەرکردن.
***v.i.*** (١) داپۆشران (وەك: ئاو بە کەف یا خڵتەو پیسی و گەندوگوو).
(٢) بڵاوبوونەوە بەسەر رووپەکدا؛ کشان؛ کشانەوە.
(٣) رەنگ سوور هەڵگەڕان (لە خۆشی یا تەریقیدا).
**mantlepiece** (man′t'l-pēs′), *n.* = mantelpiece.
**mantra** (man′trə), *n.* ووتەی پیرۆز: بریتییە لە چەند ووتەیەك لەکاتی
نوێژ یا دۆعاو نزاکردندا دەووترێ (ئاینی بووذی و هیندی).
**mantua** (man′chōō-ə, man′tōō-ə), *n.* عەبا؛ کراسی دەڵبی ژنان.
**manual** (man′ū-əl), *adj.* (١) دەستی؛ بە دەست کارپێکراو؛
بە دەست کراو. (٢) پەیرەونامەیی؛ رێرەونامەیی.
***n.*** (١) پەیرەونامە؛ رێرەونامە؛ پەرتووکێکی بچووکە دەربارەی شێوەی کردنی
شتێك یا بەکارهێنانی مەکینەیەك. (٢) کلیل بەند (ئۆرگانی مۆسیقا).
(٣) پەیرەونامەی بەکارهێنانی چەك بەتایبەتی تفەنگ.

**manually** (man′ū-ə-li), *adv.* به دەست (خستنەکاری مەکینە یا
لێخوڕینی): ***( to fly an airplane ~ )*** .
**manual alphabet,** ئەلف‌وبێ‌ی دەستی (بۆ کەڕولاڵ).
**manual training,** فێرکردنی پیشەی دەستی (وەك: دارتاشی،
کارەباچێتی‌و بەرگدروویی... هتد لە قوتابخانەدا)؛ ڕاهێنانی پیشەگەری.
**manufactory** (man′yoo-fak′tēr-i), *n.* = factory.
**manufacture** (man′yoo-fak′chēr), *n.* (١) دروستکردن
(بە دەست یا بە مەکینە). (٢) شتی دروستکراو؛ کەل‌وپەلی دروستکراو.
*v.t.* (١) دروستکردن (بە دەست یا بە مەکینە).
(٢) نووسین یا بەرهەم هێنان وەك بە مەکینەو بەبێ بیرلێکردنەوە (هونەر، وێژە،
پەڕتووك): ***( to ~ textbooks)*** .
(٣) هەڵبەستن (درۆ، بەڵگە، دەنگوباس)؛ داتاشین.
**manufacturer** (man′yoo-fak′chēr-ēr), *n.* خاوەن کارگە؛
پیشەساز؛ پیشەگەر؛ دروستکەر (کارگەر، کارگە، دەستگا).
**manumission** (man′yoo-mish′ən), *n.* ڕزگارکردن (بەندایەتی)؛
ئازادکردن
**manumit** (man′yoo-mit′), *v.t.* ڕزگارکردن (بەندایەتی)؛ ئازادکردن.
**manure** (mə-nyoor′, mə-noor′), *n.* پەیِن.
*v.t.* پەیِن تێکردن؛ پەیناوکردن.
**manus** (mā′nəs), *n.* (١) دەست؛ سمی پێشەوەی گیانداری بڕبڕەدار؛
چنگ؛ دەستی ورلاخ (٢) دەسەڵاتی مێرد بەسەر ژنەکەیدا (یاسای ڕۆمانی).
**manuscript** (man′yoo-skript′), *adj.* دەستنووس
*n.* دەستنووس؛ وتار، پەڕتووك، یا بڕوانامەی بە دەست نووسراو نەك بە چاپ.
**manx cat, Manx cat,** جۆرە پشیلەیەکی ماڵی بێ کلکە.
**many** (men′i), *adj.* زۆر؛ گەلێك؛ فرە؛ چەندەها.
*n.* ژمارەیەکی زۆر؛ زۆر؛ گەلێك؛ گەلێك کەس یا شت.
*pron.* ژمارەیەکی زۆر؛ زۆر؛ گەلێك.
**a good many,** ژمارەیەکی زۆر؛ زۆر؛ گەلێك.
**a great many,** ژمارەیەکی ئێجگار زۆر؛ ئێجگار زۆر
**many a man,** گەلێك کەس؛ گەلێك پیاو.
**the many,** (١) زۆربەی خەڵك.
(٢) خەڵك؛ جەماوەر
**many-sided** (men′i-sīd′id), *adj.* (١) فرە ڕوو؛ زۆر ڕوو
(٢) فرە تواناو سەر لە گەلێك شت دەرچوو.
**manzanita** (man′zə-nē′tə), *n.* دارودەوەنێکی هەمیشە سەوزی
ڕۆژاوای ئەمەریکایە گوڵی سپی‌و پەمەیی دەگرێ.
**map** (map), *n.* (١) نەخشە (جوگرافیا). (٢) شتێکی وەك نەخشە.
(٣) [Slang]. دەموچاو؛ ڕووخسار.
*v.t.* (١) نەخشەکردن؛ پیشاندان لەسەر نەخشە؛ نەخشە بۆ کردن.
(٢) ( ~ out ) نەخشەکێشان: ***( He ~ped out his working time.)*** .
(٣) ڕووی زەوی پێوان بۆ نەخشە دروستکردن.
**put on the map,** [Colloq.], ناودارکردن؛ بەناوبانگ کردن؛
ناو پێ دەرکردن
**maple** (mā′p'l), *n.* (١) کەوت؛ دارکەوت (٢) دارو تەختەی ئەم درەختە.
(٣) ڕەنگی زەردی سووربراوی ئەم دارو تەختەیە.
(٤) تامی شیلەو شەکری ئەم درەختە.
*adj.* (١) لە دارکەوت دروستکراو. (٢) شیلەی ئەم درەختەی تێکراوە.
**maple sirup,** شیلەی هەندێ توخمی دارەکەوت.
**maple sugar,** شەکری شیلەی دارەکەوت.
**maqui** (mä′kē), *n.* دەوەنێکی هەمیشە سەوزە بەرەکەی شەرابی لێ
دروست دەکرێ.
**maquis** (mä-kē′), *n.* (١) بێشە؛ بێشەڵان (کە کەسانی پەنابەرو
ڕاکردوو خۆیانی تێدا دەشارنەوە).
(٢) [M-]، خەباتکەری فەرەنسی دژی ئەڵمانییە نازییەکان.
**mar** (mär), *v.t.* شێواندن؛ تێکدان؛ لێ کەمکردنەوە (لە خۆشی‌و تەواوی‌و
چاکی)؛ لەکەدارکردن: ***( Nothing ~red this perfect day.; to ~ a happy occasion, her beauty, etc.)***
*n.* لەکە.
**marabou** (mar′ə-boo′), *n.* (١) لەقلەقێکی گەورەی ئەفەریقاییە.
(٢) پەڕە نەرمەکەی ژێر باڵ‌و کلکی ئەم لەقلەقە (شەپقەی ژنانەی لێ دروست
دەکرێ). (٣) جۆرە ئاوریشمێکی ناسکە.
**marabout** (mar′ə-bōōt′), *n.* ووشکەسۆفی؛ قەلەندەر.
**maraca** (mə-rä′kə), *n.* کوولەکەی مل درێژی ووشك کراوە (کە دەنکە
زیخ یا دانەوێڵەی تێ دەکرێ‌و وەك ئامێرێکی مۆسیقی بەکاردەهێنرێ).
**marasca** (mə-ras′kə), *n.* جۆرە گێلاسێکی کێوییە.
**maraschino** (mar′ə-skē′nō), *n.* جۆرە خواردنەوەیەکی
سەرخۆشکەرە لە گێلاسی کێوی دروست دەکرێ.
**marasmus** (mə-raz′məs), *n.* بەرەبەرە پووکانەوەی لەش
(بەتایبەتی لە منداڵدا).
**marathon** (mar′ə-thon′, mar′ə-thən), *n.* (١) پێشبڕکێیەکی
ڕاکردنە ماوەکەی بیست‌وشەش میل‌و سێ‌سەدو هەشتاوپێنج یاردەیە.
(٢) ملەملەیەکی درێژخایەن: ***( a dance ~ )*** .
**maraud** (mə-rôd′), *v.i.* پێداگەڕان بۆ تاڵانکردن؛ تاڵانکردن.
*v.t.* تاڵانکردن.
*n.* تاڵانکردن؛ تاڵانکردن‌و کوشتن‌و بڕین؛ هێرشێك بۆ تاڵانکردن.
**marauder** (mə-rôd′ēr), *n.* تاڵانکەر؛ تاڵانکەرو بکوژو بڕ.
**marble** (mär′b'l), *n.* (١) مەڕمەڕ؛ تەختەبەردی مەڕمەڕ؛ بەردە مەڕمەڕ.
(٣) شتێکی سەخت‌و ساف‌ولووس وەك مەڕمەڕ. (٤) هەڵمات.
(٥) (*pl.*)، هەڵماتێن؛ مووشێن. (٦) (*pl.*)، کۆمەڵێك پەیکەری مەڕمەڕ.
*adj.* (١) لە مەڕمەڕ دروستکراو؛ مەڕمەڕ. (٢) سەخت‌و ساف‌ولووس.
-marbly *(adj.)*.
**marbleize** (mär′b'l-īz′), *v.t.* وەك مەڕمەڕ لێکردن (لە ڕەنگ‌و
شێوەدا).
**marbling** (mär′bliŋ), *n.* (١) مەڕمەڕکاری؛ وەك مەڕمەڕ لێکردن
(لە ساف‌و لووسی‌و ڕەنگ‌و دەماردەماریدا).
(٢) شێوەو ڕەنگی مەڕمەڕ.
(٣) بەرگ‌و پەڕە وەك مەڕمەڕ نەخشکردن (پەڕتووك بەندی).
**marc** (märk), *n.* (١) تلپەو پاشەڕۆکی تری‌و میوەی تری گوشراو.
(٢) " براندی " لەم تلپەو پاشەڕۆکە دروستکراو.
**March** (märch), *n.* مارت؛ نەورۆز؛ خاکەلێو.
**march** (märch), *v.i.* (١) بە ڕیز ڕۆیشتن (وەك سەرباز).
(٢) ڕەوتکردن. (٣) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن بە ڕێك‌وپێکی‌و سەرەوەر؛ کشان.
*v.t.* بە ڕیز ڕەوت پێکردن وەك سەرباز.
*n.* (١) (ا) بە ڕیز ڕۆیشتن وەك سەرباز؛ ڕۆیشتنی سەربازانە.
(ب) پێ ڕۆیشتن.
(٢) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن: ***( the ~ of events)*** .
(٣) ڕەوت.
(٤) قۆناغ: ***( a day's ~ )*** .
(٥) بە پێ ڕۆیشتنێکی دووروودرێژو ماندووکەر.
(٦) مارش: مۆسیقای ڕەوتی سەربازی.
**on the march,** لە پێشکەوتندایە؛ بەرەو پێشەوە دەڕۆن:
***( Science is on the march.)***
**march** (märch), *n.* (١) سنووری وولات؛ سنوور.
(٢) ناوچەی سەر سنووری دوو وولات کە ناکۆکی لەسەر بێ چونکە هەردوولا
داوای دەکەن.
**marcher** (mär′chēr), *n.* کەسێکی وەك سەرباز ڕۆیشتوو؛
بەشدارێکی ڕێ پێوان.
**marchesa** (mär-ke′zä), *n.* مەرکیزە: ژن یا بێوەژنی مەرکیز
(ووشەی داهاتوو ببینە).
**marchese** (mär-ke′ze), *n.* مەرکیز: بەگزادەی ئیتالی.

**marching orders,** (١) فەرمانی لەشکر بۆ چوون بۆ جەنگ؛ فەرمانی دەستپێکردنی خەباتێك یا كارێك. (٢) فەرمانی دەركردن (لە شوێنێك یا كارێك)

**marchioness** (mär′shən-is, mär′shə-nes′), *n.* (١) ژنە - بەگزادە (٢) marchesa

**marchland** (märch′land′), *n.* ناوچەی سەر سنوور.

**marchpane** (märch′pān′), *n.* = marzipan.

**Mardi gras,** ماردی گرا: ڕۆژی کەرنەڤاڵ لە شاری " نیوئۆرلیانس " ی ئەمەریکی و " پاریس " و هەندێ شوێنی تر.

**mare** (mâr), *n.* ماین؛ ماکەر؛ هێسترە مێچکە.

**mare** (mâr′i), *n.* (١) دەریا (٢) ناوچەیەکی تاریکی سەر ڕووی مانگ (لە کۆندا وا دەزانرا کە دەریایە).

**mare** (mâr), *n.* دەعبا یا جنۆکەیەکە لە کۆندا وایان دەزانی کە دەبێتە هۆی مێردەزمە

**mare's-nest** (mârz′nest′), *n.* (١) ساختە؛ درۆ؛ شتێکی درۆزنە. (٢) بارێکی زۆر ئاڵۆز.

**mare's-tail** (mârz′tāl′), *n.* (١) پەڵە هەورێکە لە شێوەی کلکی ئەسپدا (گوایە نیشانەی ناووهەوای ناخۆشە). (٢) ڕووەکێکی ئاوییە گوڵی زۆر بچووك دەگرێ و گەڵاکانی وەك تاڵەموو بارێکن.
(٣) ڕووەکێکی لاسك بۆشە.

**margarine** (mär′jə-rin, mär′jə-rēn′), *n.* مارجەرین ڕۆنی ڕووەك (وەك کەرە وایە)

**margarita** (mär′gə-rit′ə), *n.* مارگەریتە کۆکتێلێکی سەرخۆشکەرە لە " تەکیلە " و ئاوی لیمۆ دەکرێ (خوێ دەکرێتە بە قەراغی ئەو پەرداخەی پێی دەخورێتەوە)

**margin** (mär′jin), *n.* (١) قەراغ؛ کەنار؛ لێوار؛ تەنیشت:
*( the ~ of a pool, pond, etc.)*
(٢) پەراوێز: پەرتووك، دەفتەر.
(٣) پلەی جیاوازی:
*( a ~ of 500 votes; He escaped defeat in the election by a narrow ~ .)*
(٤) یەدەك: پارە، کات؛ سپێر
(٥) جیاوازی نێوان نرخی کڕین و فرۆشتنی فرۆتەنی و بەشەکانی کۆمپانیاکانی بۆرسە (٦) ا) کەمترین پلەی قازانج کە لەوە کەمتر بۆ کۆمپانیایەك دەست نادات ئیتر کار بکات. (ب) جیاوازی نێوان نرخی فرۆشتنی شتومەك و نرخی دروستکردنی

*v.t.* (١) سنوور بۆ کردن؛ قەراغ بۆ دروستکردن.
(٢) نووسینەوە لە پەراوێزی پەرتووك یا دەفتەردا؛ کورتکردنەوە لە پەراوێزدا.

**marginal** (mär′ji-n′l), *adj.* (١) پەراوێزی؛ لە پەراوێزدا نووسراو:
*(~ notes)*
(٢) سنووری؛ قەراغی.
(٣) کەم؛ زۆر کەم؛ ناگرنگ: *( ~ abilities, differences, profits)* .

**marginalia** (mär′jə-nā′li-ə, mär′jə-nāl′yə), *n.pl.* تێبینی پەراوێزی.

**marginate** (mär′jə-nāt′), *v.t.* پەراوێز بۆ کردن؛ سنوور بۆ کردن.
*adj.* پەراوێزدار؛ سنووردار؛ قەراغدار.
**-margination** *(n.).*

**margrave** (mär′grāv), *n.* (١) فەرمانڕەوای سوپایی ناوچەیەکی سنووری ئەڵمانی. (٢) میری ئەڵمانی؛ شازادەی ئەڵمانی.

**margraviate** (mär-grā′vi-it), *n.* ناوچەی سنووری ژێردەستی فەرمانڕەوای سوپایی

**marguerite** (mär′gə-rēt′), *n.* جۆرێکە لە گوڵە چاوبەشیلە

**marigold** (mar′i-gōld′), *n.* گوڵە شەستپەڕ؛ هەمیشە بەهار؛ گوڵە قەیفە

**marijuana, marihuana** (mâr′i-wä′nə), *n.* مەریوانە؛ بەنگ

**marimba** (mə-rim′bə), *n.* ئامێرێکی مۆسیقییە

**marina** (mə-rē′nə), *n.* لەنگەرگای بەلەم و یەخت؛ بەندەری بچووکی بەلەم و کەشتی و یەخت.

**marinade** (mar′ə-nād′), *n.* (١) خۆشاوی گۆشت و ماسی تیادانان پێش برژاندن یا سوورکردنەوەی (کە لە سرکە یا شەراب و بەهارات پێکدێت)
(٢) گۆشت و ماسی خۆشاوکراو یا ترش و خوێ کراو.

**marinate** (mar′ə-nāt′), *v.t.* خۆشاوکردن یا ترش و خوێ کردنی گۆشت و ماسی.

**marine** (mə-rēn′), *adj.* (١) (ا) دەریایی؛ تایبەتی بە دەریا:
*( ~ exploration)*
(ب) دەریایی؛ ئاوی؛ لەناو دەریادا ژیاو (گیاندار، ڕووەك): *( ~ life)*
(٢) تایبەتی بە هاتوچۆ و بازرگانی دەریایی.
(٣) تایبەتی بە کەشتی ڕانی: *( ~ chart)* .
(٤) تایبەتی بە سەرباز یا لەشکری پیادەی دەریایی.
*n.* (١) (ا) سەربازی هێزی دەریایی پیادە
(ب) [M-]: سەربازی هێزی دەریایی پیادەی ئەمەریکی
(٢) کەشتی بازرگانی و سوپایی بە کۆمەڵ؛ سەرجەمی کەشتی وڵاتێك.
(٣) وەزارەتی دەریایی (لە هەندێ وڵاتدا)
(٤) وێنەی دەریا یا کەشتی

**Marine Corps,** هێزی دەریایی ئەمەریکی.

**mariner** (mar′ə-nẽr), *n.* کەشتیوان؛ دەریاوان؛ دەریایی.

**Mariolatry** (mâr′i-ol′ə-tri), *n.* مریەم پەرستی.

**marionette** (mar′i-ə-net′), *n.* بووکە سەماکەرە؛ بیجبیجەخانی بە دەست یا بە تەل جوولێنراو.

**marital** (mar′ə-t′l), *adj.* (١) مێردی؛ هی مێرد.
(٢) ژن و مێردی؛ هی ژن و مێردی؛ خێزانی؛ هی ژنهێنان و شووکردن؛ هاوسەری: *( ~ status)*

**maritime** (mar′ə-tīm′), *adj.* (١) نزیك بە دەریا؛ تەنیشت دەریا؛ سەر دەریا: *( ~ provinces; a ~ people)* .
(٢) هی کەشتی ڕانی؛ هی بازرگانی و هاتوچۆی دەریایی: *( ~ laws)* .
(٣) کەشتییەوانی؛ دەریاوانی؛ تایبەتی بە کەشتییەوانان.

**marjoram** (mär′jẽr-əm), *n.* جاترە کێویلە.

**mark** (märk), *n.* (١) نیشانە؛ نیشان. (٢) نیشانەیەکی تایبەتی:
(ا) نیشانەی خاڵبەندی (زمانەوانی): *( punctuation ~s)* .
(ب) شەقڵ؛ نیشانی سەر شتومەك (بازرگانی): *( a trade- ~ )* .
(ج) نیشانەی باشی و خانەدانی:
*( Politeness is a ~ of good upbringing.)*
(د) نمرە (قوتابخانە): *( a ~ of "B" in history)* .
(هـ) مۆر. (و) درووشم.
(٣) پلەو نیشانەی لێهاتوویی و پەسەندکراوی:
*( This novel dosen't come up to the ~ .)*
(٤) گرنگی؛ پایە بەرزی؛ لێهاتوویی؛ ناسراوی؛ بەناوبانگی:
*( a man of ~ )*
(٥) کارتێکردن؛ نیشانەی ئەم کارتێکردنە:
*( Good teachers have their ~s on their students.)*
(٦) نیشانەی ڕانومایی. (٧) پلە؛ ئاست؛ شوێن.
(٨) (ا) نیشان (بۆ تەقەلێکردن و پێکان). (ب) ئامانج؛ ئاوات.
(٩) سەرنج پێدانێك؛ گوێ پێدانێك؛ وریابوون.
(١٠) [Archaic]، (ا) سنووری وڵات؛ سنوور.
(ب) موڵکی گشت دێ، شارۆچکە، یا کۆمەڵ.
(١١) ئاست یا هێڵی دەستپێکردنی پێشبڕکێ.
*v.t.* (١) نیشانەکردن؛ نیشانکردن؛ دیاریکردن.
(٢) نووسین؛ وێنەکردن؛ لەسەر نووسین.
(٣) پیشاندان بە نیشانەیەك.
(٤) دەرخستن؛ پیشاندان: *( Her smile ~ed her happiness.)* .

(٥) جیاکردنەوە؛ دیاریکردن.
*( Great scientific discoveries ~ed the 19th century.)*
(٦) سەبرکردن؛ تێبینین؛ سەرنج پێدان: *( M~ my words.)* .
(٧) نمرە پێدان؛ نمرە لەسەر دانان.
*( The teacher ~ed the examination papers.)*
(٨) نرخ لەسەر دانان (فرۆتەنی).
(٩) تۆمارکردن یا ڕاگرتن (خاڵی پێشبڕکێ).
*v.i.* (١) نیشانەکردن؛ نیشانکردن؛ دیاریکردن
(٢) تێبینی کردن؛ سەرنجدان. (٣) تۆمارکردن یا ڕاگرتن (خاڵی پێشبڕکێ)
**beside the mark,** (١) نەپێکان (٢) بێ پەیوەندی
**hit the mark,** (١) لە نیشان دان؛ پێکان؛ نیشان شکاندن.
(٢) سەرکەوتن؛ بە ئامانج گەیشتن (٣) ڕاست بوون؛ ڕاست کردن.
**make one's mark,** ناودەرکردن؛ ناوبانگ دەرکردن؛
سەرکەوتن و ناوپەیداکردن.
**mark down,** (١) نووسین؛ تۆمارکردن (٢) نرخ شکاندن یا کەمکردنەوە.
**mark off ( or out ),** سنوور نیشانەکردن؛ سنوور بۆ دانان؛ جیاکردنەوە
**mark out for,** بۆ هەڵبژاردن؛ بۆ جیاکردنەوە.
**mark time,** (١) هەنگاوسان هەر لە شوێنی خۆدا:
قاچ بەرزو نرم کردنەوە لە شوێنی خۆدا بەبێ ڕۆیشتن بۆ پێشەوە.
(٢) پێش نەکەوتن؛ لە جێی خۆدا مانەوە (٣) کات کوشتن؛ کات بردنەسەر.
**mark up,** (١) نیشانەکردن (٢) نرخ زیادکردن (فرۆتەنی).
**miss the mark,** (١) نیشان نەشکاندن؛ لە نیشان نەدان؛ نەپێکان؛
بە ئامانج نەگەیشتن (٢) ڕاست نەکردن؛ بەهەڵەداچوون؛ لە ڕاستییەوە دوور.
**mark** (märk), *n.* (١) سەنگێکی کۆنی ئەورووپایی زێڕو زیوە.
(٢) مارک پارەی ئەڵمانی (٣) پارەیەکی ئوسکوتلەندی کۆنە.
**markdown** (märk′doun´), *n.* (١) نرخ شکاندن (فرۆتەنی).
(٢) چەندی ئەم نرخ شکاندنە
**marked** (märkt), *adj.* (١) نیشانەکراو؛ نیشانکراو: *( ~ cards)* .
(٢) دەستنیشان کراو (لەبەر گومانداری و ناحەزی) *( a ~ man)* .
(٣) زۆر دیار؛ لەبەرچاو؛ ئەوتۆ: *( a ~ change in behavior)* .
**markedly** (mär′kid-li), *adv.* زۆر؛ بە زۆری؛ ئێجگار زۆر؛ ئەوتۆ.
**marker** (mär′kēr), *n.* (١) نیشانەکەر؛ شتی نیشانەکەر: (ا) کێلە قەبر
(ب) نیشان یا نیشانەی سەر ڕێگە (ج) شریتێك یا شتێکی ترە کە لەو شوێنەی
پەڕتووکێکدا دادەنرێ کە خوێنەرەکە دەیگاتێ
(٢) فرۆتەی نیشانەکەر (٣) خوێنەرەوەی نووسراو و نمرە پێدەری
(٤) هێڵ بەسداخی بچووك، یا شتی تر کە یاریگای پێ نیشانە دەکرێ.
(٥) (ا) تۆمارکەری خاڵی یاری و پێشبڕکێ (مرۆڤ، ئامێر).
(ب) خاڵی یاری یا پێشبڕکێ
**market** (mär′kit), *n.* (١) بازاڕ (٢) خەڵکی ناو بازاڕ
(٣) فرۆشگە؛ دووکان: *( a meat ~ )*
(٤) کڕین و فرۆشتن (شتومەك، پارەبازی)؛ ئاڵوویر *( an active, slow, ~ )* .
(٥) نرخ؛ نرخی ئێستای شتێك.
*v.t.* (١) بردنە بازاڕ؛ ناردنە بازاڕ (٢) خستنە بازاڕەوە (٣) فرۆشتن
*v.i.* (١) کڕین و فرۆشتن؛ کڕین یا فرۆشتن (٢) ئازووقە کڕین
**be in the market for,** ویستن؛ حەز بە کڕینی کردن؛
پێویست پێ بوون
**be on the market,** خرانە ناو بازاڕەوە.
*( His house is on the market.)*
**buyer's market,** بازاڕی کڕیارە؛ باری بازاڕ لە سوودی کڕیارە (لەبەر
زەبەنەیی فرۆتەنی)
**put on the market,** خستنە بازاڕەوە
**seller's market,** بازاڕی فرۆشیارە؛ باری بازاڕ لە سوودی فرۆشیارە
(لەبەر کەمی فرۆتەنی).
**marketability** (mär′kit-ə-bil′ə-ti), *n.* (١) بازاڕ هەبوون؛
باش بوون بۆ فرۆشتن؛ کڕیار بۆ هەبوون (٢) برەو

**marketable** (mär′kit-ə-b'l), *adj.* (١) دەفرۆشرێ؛ بازاڕی هەیە.
(٢) بەبرەو. (٣) تایبەتی بە کڕین یا فرۆشتن.
**market-place** (mär′kit-plās´), *n. Also* **market place,** (١)-
بازاڕ. (٢) شوێنی ئاڵوویرکردن (مەجاز)؛ شوێنی ئاڵوگۆڕکردنی بیروباوەڕ؛
بازاڕ: *( the ~ of ideas)* .
**market price,** نرخی بازاڕ.
**market value,** نرخی بازاڕ.
**marking** (mär′kiŋ), *n.* (١) نیشانەکاری؛ نیشانەکردن؛ نیشانکردن.
(٢) نیشان؛ نیشانە.
(٣) نیشانەی ڕەنگ و شتی گیاندار یا ڕووەك.
**marksman** (märks′mən), *n.* نیشانچی؛ نیشان شکێن؛
دەست ڕاست.
**marksmanship** (märks′mən-ship´), *n.* نیشانچێتی؛
نیشان شکێنی؛ دەست ڕاستی
**markup** (märk′up′), *n.* (١) نرخ زیادکردن.
(٢) چەندی ئەم نرخ زیادکردنە.
(٣) ئەو زیادەیەی دەخرێتە سەر نرخی تێچوونی فرۆتەنییەك بۆ فرۆشتنی
بە قازانج.
**marl** (märl), *n.* (١) خاکێکە بۆ پەیناوکردن و خشت و چیمەنتۆ
درووستکردن بەکاردەهێنرێ. (٢) [Poetic]، زەمین
*v.t.* پەیناوکردن بەم خاکە.
**marlin** (mär′lin), *n.* (١) ماسییەکی گەورەی بن دەریایە.
(٢) ڕمەماسی.
**marmalade** (mär′mə-lād´), *n.* مرەبای توێکڵ و تلپە پرتەقاڵ.
**marmoreal** (mär-môr′i-əl, mär-mō′ri-əl), *adj.* (١) مەڕمەڕ.
(٢) وەك مەڕمەڕ ساف و لووس و سارد و سپی.
**marmorean** (mär-môr′i-ən, mär-mō′ri-ən), *adj.*
marmoreal.
**marmoset** (mär′mə-zet´), *n.* مەیموونێکی بچکۆلەی ئەمەریکای
باشوورو ناوەڕاستە.
**marmot** (mär′mət), *n.* مشکەشاخی؛ گیاندارێکی کرۆژەندەی
قەڵەوی تووك زبری کلك تووکن و کورتە.
**maroon** (mə-rōōn′), *n. & adj.* سووری قاوەیی؛ سووری تێر؛
شەرابی.
**maroon** (mə-rōōn′), *n.* (١) (ا) قولەڕەشی بەندی ڕاکردوو یا پەنابەر.
(ب) وەچەی قولەڕەشێکی وەها.
(٢) [Rare]، کەسێکی گیرخواردوو لە چۆڵەوانییەکدا.
*v.t.* (١) بەجێهێشتنی کەسێك لە دوورگەیەك یا کەناردەریایەکی چۆڵدا
بۆئەوەی دەنگی بە کەس نەگات و سزا بچێژێ.
(٢) بەجێهێشتن لە چۆڵەوانییەکدا کە لێ دەربازبوون یا ڕزگاربوونی نەبێ؛
گیر پێ خواردن.
**marplot** (mär′plot´), *n.* کەسێکی بێ مێشك کە شت تێك دەدات بە
خۆتێهەڵقورتاندن.
**marque** (märk), *n.* (١) تۆڵە. (٢) **letters of marque** .
**marquee** (mär-kē′), *n.* (١) چادرێکی گەورەی لاکراوەیە بۆ ئاهەنگی
دەرەوە. (٢) چەترێکی گەورەی سەربان ئاسایە بەسەر بەردەرگای میوانخانە و
سینەما و شوێنی ترەوە. (هەروەها پێشی دەوترێ: " marquise " )
**marquess** (mär′kwis), *n.* = **marquis.**
**marquetry, marqueterie** (mär′kə-tri), *n.* ڕازاندنەوەی
کورسی و مێز بە سەدەف و نەقشی جوان.
**marquis** (mär′kwis), *n.* مەرکیز: بەگزادەی هەندێ وڵاتی
ئەورووپایی.
**marquise** (mär-kēz′), *n.* (١) مەرکیزی ژن: (ا) ژن یا بێوەژنی
" مەرکیز " . (ب) ژنە بەگزادە (٢) **marquee** .
(٣) ئەمووستیلەیەکە بەردی بەنرخی هێلکەیی تێدا چەسپێنراوە.

**marriage** (mar′ij), *n.* (١) ژنهێنان؛ شووکردن؛ ژنهێنان و شووکردن.
(٢) ژن و مێردایەتی. (٣) شایی. (٤) مارە؛ مارەبڕین.
(٥) یەکێتی. پەیوەندی زۆر نزیك.
**marriageable** (mar′ij-ə-b'l), *adj.* بەشوو؛
تەمەنی بۆ ژنهێنان یا شووکردن دەشێ
**marriage certificate,** مارەنامە
**married** (mar′id), *adj.* (١) ژندار؛ مێردار؛ خێزاندار
(٢) تایبەت بە ژن و مێردی؛ ژن و مێردی.
(٣) زۆر نزیك؛ گیانی بە گیانی؛ یەکگرتوو.
**marron** (mar′ən), *n.* (١) جۆرێکە لە کەستەنە؛ کەستەنەی ئیسپانی.
(٢) درەختی کەستەنە
**marrow** (mar′ō), *n.* (١) مۆخ. (٢) ناوکرۆك؛ ناوەڕۆك؛ نەژاد.
(٣) زیندوێتی؛ هێزی ژیان؛ هێز.
**marrowbone** (mar′ō-bōn′), *n.* (١) ئێسقانی مۆخدار؛
ئێسقانی ناو شلەو شۆربا. (٢) (*pl.*)، (ا) ئەژنۆ (لەڕووی پێکەنینەوە).
(ب) ئێسقانی چەپ و ڕاست.
**marry** (mar′i), *v.t.* (١) مارەکردن؛ لێ مارەبڕین.
(٢) ژنهێنان؛ هێنان؛ شووپێکردن؛ شووکردن.
(٣) (~ off)، بەشوودان: *(to ~ off one's daughter)*.
(٤) یەك پێگرتن؛ یەکگرتن؛ بوون بە یەك.
*v.i.* (١) شووکردن؛ ژنهێنان (٢) بوون بە یەك؛ یەکگرتن.
**marry** (mar′i), *interj.* [Archaic or Dial.]. وتەیەکە سەرسامی
یا تووڕەیی دەردەبڕێ.
**Mars** (märz), *n.* (١) خودای جەنگ (ئەفسانەی ڕۆمانی).
(٢) جەنگ؛ شەڕوشۆڕ. (٣) مەریخ: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە.
**marsh** (märsh), *n.* زەلکاو؛ زۆنگاو؛ زۆنگ.
**marshal** (mär′shəl), *n.* (١) کاربەدەستێکی گەورەی کۆشکی
شاهانەی کۆن (بۆ سەرپەرشتی کاروباری سوپایی و ئاهەنگ).
(٢) مارشاڵ. بەرزترین پلەی ئەفسەری.
(٣) سەرپەرشتیاری خۆپیشاندان یا ڕێ پێوشتن؛ ڕێکخەری خۆپیشاندان
(کە بالبەند دەبەستێ): *(the ~ of a parade)*.
(٤) (ا) یاساوڵی دادگا.
(ب) سەرۆکی پۆلیس یا فەرمانگەی ئاگرکوژاندنەوە لە هەندێ شاری ئەمریکادا.
*v.t.* (١) ڕێکخستن؛ ڕیزکردن و ئامادەکردن (بۆ بەرەنگاری)؛ کۆکردنەوەو
ئامادەکردن *(to ~ military forces, forces, facts, etc.)*.
(٢) (ا) ڕێ پیشاندان؛ ڕابەری کردن؛ بردن بۆ
*(to ~ persons into the presence of the king.)*
(ب) سەرپەرشتی کردن؛ سەرەوکاری کردن؛ بەڕێوەبردن.
*v.i.* ڕێکخستن (درووشمی قەڵغان و تیرە).
**marshalcy** (mär′shəl-si), *n.* پلەوپایەی مارشاڵ
**-marshalship** *(n.)*.
**marsh elder,** چەند جۆرە ڕووەکێکی ئەو زەلکاوە.
**marsh gas,** میسان: گازی زەلکاو.
**marsh hawk,** هەڵۆی زەلکاو
**marsh hen,** (١) مریشکە ڕەشەی ئەمەریکی.
(٢) باڵندەیەکی ناو زەلکاوە وەك قولنگ وایە.
**marshiness** (mär′shi-nis), *n.* زەلکاوێتی؛ زۆنگاوێتی
**marsh mallow,** (١) ڕووەکێکی زەلکاوییە (ڕەگەکەی دەکرێ بە
دەرمان و شیرینی). (٢) شیرینییەکە لە ڕەگی ئەم ڕووەکەو جەلاتین و شەکرو
نیشاستە درووست دەکرێ.
**marshy** (mär′shi), *adj.* (١) زەلکاوی *(~ land)*.
(٢) لە زەلکاودا دەژی؛ نیشتەجێی زەلکاوە.
**marsupial** (mär-sōō′pi-əl, mär-sū′pi-əl), *adj.* توورەکەدار؛
تایبەتی بە گیاندارە شیردەرە توورەکەدارەکان وەك کەنگەر.
*n.* گیانداری شیردەری توورەکەداری وەك کەنگەر.

**marsupium** (mär-sōō′pi-əm), *n.* (١) توورەکەی ژێرسکی هەندێ
گیانداری وەك کەنگەر. (٢) توورەکەیەکی وەها لە هەندێ ماسی و گیانداری
قاووغداری ئاویدا.
**mart** (märt), *n.* (١) بازاڕ. (٢) [Obs.]، (ا) ئالوویێر.
(ب) پیشانگە یا بازاڕێکی کاتی.
**marten** (mär′t'n), *n.* (١) دەڵەك. (٢) کەوڵ یا فەروەی دەڵەك.
**martial** (mär′shəl), *adj.* (١) جەنگی؛ بۆ جەنگ شیاو؛
شەڕوشۆڕی: *(~ music, songs, etc.)*.
(٢) جەنگاوەر؛ ئازا.
(٣) سوپایی: *(~ court)*
(٤) [Archaic]. ئاسنی؛ ئاسنین.
(٥) [M-]، لەژێر ڕکێفی چەپەڵی " مەریخ " دایە (ئەستێرەوانی)
**martial law,** دەسەلاتی سوپایی؛ فەرمانڕەوایی سوپایی.
**martin** (mär′t'n), *n.* باڵندەیەکە لە توخمی پەڕەسێلکە.
**martinet** (mär′t'n-et′, mär′t'n-et′), *n.* (١) ئەفسەری بەزەبرو
توندوتیژ. (٢) کەسێکی بەزەبرو توندوتیژ.
**martingal** (mär′t'n-gal′), *n.* = **martingale.**
**martingale** (mär′t'n-gāl′), *n.* (١) قایشی نێوان تەنگەی ئەسپ و
ڕەشوە یا لغاوەکەی (بۆ ئەوەی سەرکێشی نەکات)
(٢) (ا) گوریسی ڕاگرتنی تەوەری بەلەم و کەشتی با.
(ب) سنگی ژێر تەوەری پێشەوەی بەلەم و کەشتی با.
(٣) زیادکردنی ئەو پارەیەی قوماری لەسەر دەکرێ لەلایەن کەسی دۆڕاوەوە
پاش هەموو دۆڕانێك بۆ هێنانەوەی ئەوەی کە دۆڕاندوویەتی.
**martini** (mär-tē′ni), *n.* مارتینی: کۆکتێلێکی سەرخۆشکەرە لە
" جن " و " فەرمووس " پێکدێت.
**martlet** (märt′lit), *n.* (١) **martin**.
(٢) درووشمێکی خانەدانی و سوارچاکییە بریتییە لە باڵندەیەکی بێ لاقی
وەك پەڕەسێلکە
**martyr** (mär′tēr), *n.* (١) گیانبەخش (لەپێناوی ئاین یا بیروباوەڕدا)؛
شەهید؛ خۆبەختکەر. (٢) کەسێکە کە ئازارو ناخۆشی و ئوخاوی زۆر دەچێژێ.
(٣) کەسێکە کە پیشانی خەڵکی دەدات کە لە ئازارو ناخۆشیدایە بۆ هاوسۆزی
کردن لەگەڵیدا.
*v.t.* (١) کردن بە قوربانی؛ کوشتن لەبەر پەشیمان نەبوونەوە لە ئاین یا ڕێبازو
بیروباوەڕێك. (٢) چەوساندنەوە؛ ئازاردان؛ ئوخاوکردن بە دڵدا.
**martyrdom** (mär′tēr-dəm), *n.* (١) گیانبەخشی (لەپێناوی ئاین
یا بیروباوەڕدا)؛ شەهیدبوون؛ خۆبەختکردن. (٢) ئازارو مەینەتی چەشتن؛
ئوخاوێکی زۆر چەشتن؛ چەوسانەوە
**martyrology** (mär′tēr-ol′ə-ji), *n.* (١) تۆمارنامەی گیانبەخشان.
(٢) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی گیانبەخشان بەتایبەتی هی خاچ پەرستان.
(٣) ژیاننامەی گیانبەخشان (مێژووی خاچ پەرستی).
**martyry** (mär′tēr-i), *n.* نزرگەی گیانبەخش؛ گومەزی شەهید.
**marvel** (mär′v'l), *n.* (١) شتێکی زۆر سەیر؛ بلیمەت.
(٢) [Archaic]، سەرسووڕمان.
*v.i. & v.t.* سەرسووڕمان؛ سەر لێ سووڕماندن.
**marvelous, marvellous** (mär′v'l-əs), *adj.* (١) زۆر سەیرو
نائاسا؛ سەرسووڕمێنەر. (٢) [Colloq.]، زۆرباش؛ نایاب؛ پەسەند؛ زۆر چاك.
**Marxian** (märk′si-ən), *adj. & n.* تایبەت بە کارل مارکس؛
مارکسی.
**Marxism** (märk′siz'm), *n.* مارکسیەت: فەلسەفەو بیروباوەڕی
کارل مارکس.
**Marxist** (märk′sist), *adj.* مارکسی؛ تایبەت بە کارل مارکس.
*n.* مارکسی؛ کەسێکی مارکسی؛ لایەنگری مارکسیەت.
**Mary** (mâr′i), *n.* مریەم؛ دایکی عیسا.
**marzipan** (mär′zi-pan′), *n.* شیرینییەکە لە بادەمی هاڕراوو شیرو
سپێنەی هێلکە درووست دەکرێ. (پێشی دەوترێ: " **marchpane** ").

**mascara** (mas-kar′ə), *n.* ماسکاره ئارایشتێکه وەك کل وایه برژانگ‌و برۆی پێ رەنگ دەکرێ.
**mascot** (mas′kot, mas′kət), *n.* کەسێك، گیانداریك یا شتێکه گوایه بەختەوەری لەدوایه یا دەهێنێت بەسەر خەڵکدا (بەتایبەتی کە بکرێ بە درووشمی تیپێکی وەرزشی یا رێکخراوێك).
**masculine** (mas′kyoo-lin), *adj.* (١) نێرینه؛ نێر
(٢) بەهێز وەك پیاو؛ پیاوانه. (٣) بۆ پیاو دەشێ؛ پیاوانه؛ کورانه.
(٤) له پیاو دەچێ (ژن)؛ کوڕانی؛ ژنه کوڕانی *( a ~ woman)* .
(٥) نێرینه (ڕێزمان): *( the ~ gender)*
*n.* (١) (ا) نێر؛ نێرینه. (ب) پیاو؛ کوڕ.
(٢) (ا) توخمی نێرینه (ڕێزمان). (ب) ووشەیەکی وەها
**masculinity** (mas′kyoo-lin′ə-ti), *n.* نێرینەیی؛ نێری؛ پیاوەتی؛ بەهێزی‌و نێری.
**mash** (mash), *n.* (١) جۆی خووساوی هاڕراو (کە بیرەی لێ دروست دەکرێ). (٢) دانەوێڵەی هاڕراوی خووساو (کە دەدرێ بە ئاژەڵ‌و ڕەشەووڵاخ‌و ئەسپ‌و مریشك). (٣) هەریسه.
*v.t.* (١) جۆ خووساندن‌و بیره لێ دروستکردن.
(٢) فلیقانەوە؛ هاڕین‌و وەك هەویر یا هەریسه لێکردن: *( ~ potatoes)* .
(٣) هاڕین؛ کوتان. (٤) [Slang]، چاوباشقاڵی یا چاوبازی لەگەڵ کردن.
**masher** (mash′ẽr), *n.* (١) ئامێری فلیقانەوەی سەوزەو میوه.
(٢) [Slang]. پیاوێکه کە بە زۆر دەیەوێ چاوباشقاڵی بکات لەگەڵ ئافرەتێکی نەناسیاودا
**mashie, mashy** (mash′i), *n.* جۆره گوڕزێکی یاری " گۆلف " ه.
**mask** (mask, mäsk), *n.* (١) ڕووپۆش؛ ماسکه؛ دەماخ؛ دەموچاوگر.
(٢) پۆشاك؛ پۆشەنی؛ داپۆشەر. (٣) ئاهەنگێك یا کەرنەڤاڵێك کە خەڵکی دەموچاوی خۆیان دەگۆڕن یا ماسکه له دەموچاو دەکەن. (٤) دەماخکەر.
(٥) دەموچاو، بەتایبەتی: (ا) پەیکەری دەموچاو؛ قاڵبی دەموچاو.
(ب) وێنەیەکی شێواوی دەموچاو بۆ گاڵتەو لاقرتێ.
(ج) وێنەی سەرو دەموچاو کە ئەکتەرەکانی یۆنان‌و ڕۆمان لەسەر شانۆ لەسەریان دەکرد. (٦) کڵاوزرێ؛ کڵاوی گاز: *( gas ~ )* .
(٧) دەموچاو یا سەری ڕێوی‌و سەگ.
(٨) پۆشەنی مناوەرەی لەشکر. (٩) شریتی داپۆشەر. (١٠) **masque** .
*v.t.* (١) داپۆشین بە ماسکه؛ ڕووپۆشین؛ دەموچاو هەڵبەستن؛ دەماخ کردن؛ ماسکه کردنەسەر. (٢) شاردنەوە؛ داپۆشین:
*( to ~ one's enmity under an apperance of friendliness)*
*v.i.* ماسکه لەسەرکردن (بۆ کەرنەڤاڵ یا ئاهەنگ)؛ ڕووپۆشین؛ دەموچاو هەڵبەستن.
**masked** (maskt, mäskt), *adj.* (١) دەماخ کردوو؛ ڕووپۆشراو؛ ماسکه لەسەر *( A ~ gunman tried to rob the bank.)* .
(٢) شاراوە؛ داپۆشراو (بۆ بەهەڵەدابردن).
(٣) ماسکەی تێدا لەسەردەکرێ؛ خەڵکی خۆی بۆ دەگۆڕێ (کەرنەڤاڵ، ئاهەنگی سەما) *( a ~ ball)* .
**masker, masquer** (mas′kẽr, mäs′kẽr), *n.* ماسکه لەسەر؛ بەشداری کەرنەڤاڵ یا شانۆنامه بە ڕووپۆشراوی.
**masking tape,** شریتی پێوەلکێن؛ شریتی سرێشاوی؛ شریتی داپۆشەر (بۆ داپۆشینی قەراغی دەرگاو پەنجەره لەکاتی بۆیەکردندا).
**masochism** (maz′ə-kiz′m), *n.* (١) ماسۆشیەت: نەخۆشی‌یەکی دەروونی‌یه بریتی‌یه له لەزەت بینینی کەسێك له چەوسانەوەو ئازاردان‌و تێهەڵدان بە دەستی هاوسەرێنەکەی. (٢) (ا) خۆشی‌و لەزەت بینین له ئازاردان‌و چەوساندنەوەی خۆ. (ب) بە شوێن چەوسانەوەو ئازاری خۆدا گەڕان.
**masochist** (maz′ə-kist), *n.* (١) لەزەت وەرگر له چەوساندنەوەو ئازار چەشتن بە دەستی هاوسەرێنەکەی. (٢) لەزەت‌و خۆشی بین له ئازارو ناخۆشی‌و چەوساندنەوەی خۆ.
**-masochistic** *(adj.)*; **masochistically** *(adv.)*.
**mason** (mā′s′n), *n.* (١) وەستای دیوارو خانوو؛ بەردتاش؛ بەنا.
(٢) ماسۆنی.
*v.t.* بەردکاری کردن؛ بە بەرد دروستکردن؛ دیوارو خانووی بەرد دروستکردن.
**mason bee,** هەنگێکه بە تەنها دەژی‌و هێلانەکەی له قوڕ یا لم‌و خۆڵ دروست دەکات.
**Mason-Dixon line,** هێڵی مەیسن- دیکسن: سنووری نێوان ویلایەتی " مەریلاند " و " پەنسلڤانیا " کە بە سنووری نێوان بەشی خواروو سەرووی ئەمەریکا دادەنرێ.
**Masonic, masonic** (mə-son′ik), *adj.* ماسۆنی.
**Mason jar,** شووشەیەکی دەم پانی هەوابڕه لەناوماڵدا خواردەمەنی تێدا هەڵدەگیرێ.
**masonry** (mā′s′n-ri), *n.* (١) بەردکاری؛ بەردتاشی؛ پیشەی- بەردکاری؛ وەستایی خانووی بەردوخشت؛ بەردوخشتکاری؛ خانووسازی بەردو خشت. (٢) خانوو یا شتی له بەردو خشت دروستکراو؛ خانووی بەردو خشت.
(٣) [-M]، ماسۆنیەتی: (ا) بیروباوەڕو ڕێبازی ماسۆنیەتی. (ب) ماسۆنیەکان
**masque** (mask, mäsk), *n.* (١) **masquerade** .
(٢) شانۆنامەیەکی سەدانی شانزەو حەڤدەیه بە جل‌وبەرگی جوان‌و مۆسیقاو سەماوه پێشکەش دەکراو گفتوگۆی کەم تێدابوو.
**masquerade** (mas′kə-rād′, mäs′kə-rād′), *n.* (١) ئاهەنگێکه بە جلی جوان‌و دەماخ کردنەوه. (٢) جل‌وبەرگی ئاهەنگێکی وەها.
(٣) (ا) دەماخ کردن؛ خۆگۆڕین. (ب) بە درۆ وا پیشاندان؛ شتی درۆزن‌و ساخته
*v.i.* (١) بەشداربوون له ئاهەنگێکدا بە جلی جوان‌و دەماخ کردنەوه.
(٢) بە درۆ وا پیشاندان؛ خۆگۆڕین؛ ڕەفتاری ساختەو درۆزنانه نواندن؛ دەماخ کردن.
*v.t.* بە ماسکه داپۆشین؛ شاردنەوە؛ گۆڕین.
**Mass, mass** (mas, mäs), *n.* (١) نوێژی بەکۆمەڵ له کڵێسەی کاسۆلیکیدا. (٢) مۆسیقای ئەم نوێژه.
**mass** (mas), *n.* (١) تۆپەڵ؛ بارست. (٢) ژمارەیەکی زۆر؛ کۆمەڵ؛ زۆر؛ گەلێك؛ کۆمەڵێکی گەوره. (٣) جەماوەر؛ خەڵك؛ گەلێك کەس.
(٤) بارستایی؛ قەباره؛ گەورەیی. (٥) زۆربەی؛ بەشی زۆری شتێك.
(٦) تۆپەڵه کانزای ناڕێك‌وپێکی ژێرزەمین.
(٧) گیراوەی توندی حەب لێ دروستکراو (دەرمانسازی).
*adj.* (١) بەکۆمەڵ؛ فرەیی؛ بەکۆمەڵ نەك تاك تاك: *( ~ production)* .
(٢) جەماوەری؛ تایبەت بە هەمووکەس؛ گشتی: *( ~ education)* .
*v.t. & v.i.* تۆپەڵ کردن؛ کۆکردنەوە؛ کۆمەڵ کردن؛ بارست کردن؛ تۆپەڵ بوون؛ کۆمەڵ بوون.
in the mass, پێکەوە؛ بەگشتی؛ هەموو
the masses, جەماوەر؛ خەڵك؛ گەل؛ بۆرە پیاوان؛ کۆمەڵانی خەڵك.
**massacre** (mas′ə-kẽr), *n.* (١) گەلەکوشتار؛ قەلاچۆ؛ کوشتار؛ کوشتن‌و سەربڕینی دڕندانەی بەکۆمەڵ. (٢) [Slang]، بەزینێکی زۆر خراپ (یاری، وەرزش).
*v.t.* (١) قەلاچۆکردن؛ کوشتن‌و سەربڕینی گەلێك کەس یا گیاندار بەشێوەیەکی دڕندانەو بەبێ پاك‌و پیس لێکردن. (٢) [Slang]، زۆر خراپ بەزاندن (یاری، وەرزش).
**massage** (mə-säzh′), *n.* مەساج؛ شێلان؛ هەنوون؛ دەست پیاهێنان.
*v.t.* لەش شێلان؛ شێلان؛ هەنوون؛ دەست پیاهێنان؛ مەساج کردن.
**-massager; massagist** *(n.)*.
**massasauga** (mas′ə-sô′gə), *n.* مارێکی زەنگۆڵەداری خوارووی ئەمەریکایه.
**masseter** (ma-sē′tẽr), *n.* ماسولکەی جوین (له شەویلکەی لاخوارووودا).
**masseur** (ma-sũr′), *n.* پشت شێل بە پیشه؛ لەش شێل.
**masseuse** (ma-sooz′), *n.* ژنی پشت شێل بە پیشه؛ ژنی لەش شێل.
**massicot** (mas′i-kot′), *n.* ماسیکۆت: یەکەم ئۆکسیدی قوڕقوشم.
**massif** (mas′if), *n.* (١) بەشی سەرەکی ڕیزه شاخێك؛ چەند لووتکه شاخێکی لەیەکداو.

(٢) پارچەیەك زەوی دابڕاو لە دەوروپشتەكەی بە درزی گەورە.

**massive** (mas′iv), *adj.* (١) قەبە: گەورە: زۆر زل؛ فیلەتەن:
***( a ~ piece of furniture)***
(٢) گەورە: زل: بەشكۆ: ***( a ~ head, forehead, etc.)*** .
(٣) گەورە لە قەبارەو توندوتیژی و مەودادا؛ لە ئەندازە بەدەر:
***( a ~ military buildup along the frontier)***
(٤) گەورەتر یا زیاتر لە ئاسایی: ***( a ~ dose of vitamin C )*** .
(٥) گشتی: زۆر خراپ و ترسناك (ناخۆشی): ***( a ~ heart-attack)*** .

**-massiveness *(n.)*.**

**mass media,** ( sing. *mass medium* ), هۆی ڕاگەیاندنی گشتی
(تەلەفزیۆن رادیۆ، ڕۆژنامە).

**mass production,** دروستكردنی بڕێكی زۆر شتومەك بە مەكینە
بەكۆمەڵ و تێكڕایی.

**massy** (mas′i), *adj.* قەبە: گەورە؛ زۆر زل؛ قورس.

**mast** (mast, mäst), ***n.*** (١) دارئالای كەشتی و بەلەم؛
ستوونی كەشتی و بەلەم. (٢) بەشێكی ئەم دارئالایە: ***( the top ~ )*** .
(٣) تەوەر یا ستوون (مەكینە).
(٤) [M-]. دادپرسی لەلایەن ئەفسەرێكی هێزی دەریایی ئەمەریكییەوە.
***v.t.*** دارئالا تێدادانان یا خستنەسەر.

**before the mast,** (١) جێی كاری دەریاوانە ئاساییەكان لە كەشتییەكدا
نەك ئەفسەرەكان (٢) وەك دەریاوانێكی ئاسایی.

**mast** (mast, mäst), ***n.*** بەڕوو و بەری هەندێ درەختی تر كە دەدرێ بە
بەرازی ماڵی.

**mast-, = masto-.**

**mastaba, mastabah** (mas′tə-bə), ***n.*** گۆڕێكی فیرعەونەكانی
میسرە لە شێوەی ژوورێكی لاكێشەیی دیوار خواری سەربان تەختدایە.

**mastectomy** (mas-tek′tə-mi), ***n.*** مەمك دەرهێنان بە نەشتەرگەری
(پزیشكەوانی).

**master** (mas′tēr, mäs′tēr), ***n.*** (١) كەسێكی ژووردەست، سەرگەورە:
یا بەدەسەڵات (ا) گەورەی ماڵ؛ خاوەن ماڵ. (ب) سەرۆكی دەزگایەك.
(ج) خاوەن كار: سەركار: كارگێڕ. (د) خاوەن بەند؛ خاوەن گیاندار.
(هـ) سەرەك كەشتییەوانی كەشتییەكی بازرگانی (و) براوە (پێشبڕكێ).
(ز) مامۆستای پیاوی قوتابخانەی سەرەتایی.
(ح) مامۆستایەكی بەرزی فەلسەفە یا ئاین كە خەڵك شوێنی بكەون.
(٢) شتێكی بەدەسەڵات: ***( Love is his ~ .)***
(٣) (ا) وەستا؛ پیشەگەرێكی زۆر لێهاتوو. (ب) هونەرمەندێكی گەورەو لێهاتوو.
(٤) بەرهەمی هونەرمەندێكی گەورەو لێهاتوو.
(٥) سەروەر: سەرەك؛ گەورە؛ ئاغا.
(٦) [M-]. نازناوی كەسێكە بەتایبەتی: (ا) پیاوێكی پلەوپایەدار.
(ب) هەر پیاوێك یا كوڕێك. (ئێستا " Mr. " بەكاردەهێنرێ).
(ج) كوڕێك كە زۆر منداڵە تا پێی بووترێ: " Mr. " .
(د) كارگێڕ: سەركار: لێپرسراوی شوێنێك.
(٧) خاوەن بڕوانامەی " ماستەر " . (٨) یاریدەدەری دادپرس.
***adj.*** (١) تایبەتی بە سەرەك: سەرگەورە، یا ئاغا.
(٢) زۆر لێهاتوو: قاڵ؛ دەستباڵا ***( a ~ craftsman, theif, etc.)*** .
(٣) سەرەكی ***( a ~ switch, key, etc.)***
(٤) سەرچاوەیی: وێنەی سەرەكی (كە وێنەی تری لەبەر دەگیرێتەوە).
***v.t.*** (١) دابینكردن؛ بەزاندن؛ خستنە ژێردەستەوە؛ هێنانەبەر بار؛
مل پێ شۆڕكردن (٢) بەتەواوی فێربوون؛ زۆرباش فێربوون:
***( to ~ an art, a language, craft, science, etc.)***

**master-at-arms** (mas′tēr-ət-ärmz′), ***n.*** ئەفسەری دابینكردن و
ئاسایش لە كەشتییەكی جەنگیدا.

**masterful** (mas′tēr-fəl, mäs′tēr-fəl), *adj.* (١) بەزەبروزەنگ:
توندوتیژ: نێر (٢) (ا) لێهاتوو: بەتوانا؛ بەدەست: كارامە؛ شارەزا:
***( a ~ pianist)***
(ب) زۆر چاك و بە كارامانە كراو؛ كاریگەر: ***( a ~ speech)*** .

**-masterfully *(adv.)*; masterfulness *(n.)*.**

**master key,** كلیلی گشتی؛ شاكلیل؛ كلیلێكە كە چەند قفڵێكی جیاواز
دەكاتەوە

**masterly** (mas′tēr-li, mäs′tēr-li), *adj.* زۆرباش: كارامانە؛
شارەزایانە: نایاب: ***( He did a ~ job.)***
*adv.* بە كارامەیی؛ بە شارەزایانە؛ بە باشی

**-masterliness *(n.)*.**

**master mason,** وەستای لێهاتووی بەردوخشتكاری؛
سەروەستای خانوو و دیواری بەردوخشت.

**mastermind** (mas′tēr-mīnd′, mäs′tēr-mīnd′), ***n.*** كەسێكی
زۆر زیرەك بەتایبەتی دانەرو بەڕێوەبەری نەخشەیەك یا پڕۆژەیەك: نەخشەكار
*v.t.* نەخشەدانان (پڕۆژە، جووڵانەوە)؛ ڕێكخستن و ڕابەری كردن:
***( to ~ a revolution, an activity, attack, etc.)***

**Master of Arts,** ( Abbr. *A.M.; M.A.* ), (١) بڕوانامەی ماستەری
ئەدەبیات (كە ڕشتەی زانستە مرۆڤایەتییەكان و هونەر... هتد دەگرێتەوە).
(٢) وەرگری ئەم بڕوانامەیە لە زانكۆدا.

**master of cermonies,** ( Abbr. *M.C.; m.c.* ), چاودێری
ئاهەنگ؛ ڕابەری ئاهەنگ؛ ئاهەنگ گێڕ.

**Master of Science,** ( Abbr. *M.S.; M.SC.* ), بڕوانامەی ماستەر
هی زانست.

**masterpiece** (mas′tēr-pēs′, mäs′tēr-pēs′), ***n.*** (١) شاكار؛
بەرزترین و باشترین بەرهەمی هونەری. (٢) شاكاری هونەرمەندێك یا نووسەرێك؛
باشترین بەرهەمی هونەرمەندێك یا نووسەرێك.

**mastership** (mas′tēr-ship′, mäs′tēr-ship′), ***n.*** (١) دابین و
دابینكاری؛ دابینكردن. (٢) مامۆستایەتی (بەتایبەتی قوتابخانەی سەرەتایی)؛
پلەوپایەو ئەركی مامۆستایەتی. (٣) شارەزایی؛ كارامەیی؛ لێهاتوویی.
(٤) وەستایەتی؛ وەستایی

**master stroke,** كارێكی نایاب؛ كارێك یا جێبەجێكردنێكی بەرزو
لێهاتووانەو نایاب.

**masterwork** (mas′tēr-wûrk′, mäs′tēr-wûrk′), ***n.***
masterpiece.

**master workman,** (١) وەستا؛ سەروەستا. (٢) سەركار؛ كارگێڕ.

**mastery** (mas′tēr-i, mäs′tēr-i), ***n.*** (١) دابینكاری؛ دابینكردن؛
دەست بەسەردا ڕۆیشتن (٢) (ا) شارەزایی؛ كارامەیی؛ لێهاتوویی.
(ب) زانینی شتێك زۆر بە باشی: ***( a poet's ~ of the language)***

**masthead** (mast′hed′, mäst′hed′), ***n.*** (١) سەری تەوەری
كەشتی. (٢) نۆبەچی سەر تەوقەسەری تەوەری كەشتی.
(٣) ئەو بەشەی ڕۆژنامە یا گۆڤارێك كە ناوی ڕۆژنامە یا گۆڤارەكەو خاوەنەكەی و
سەرنووسەرو شوێنی بڵاوكردنەوەو نرخ... هتد، تێدا دەنووسرێ.
*v.t.* (١) كردنی كەشتیوانێك بە نۆبەچی لەسەر تەوقەسەری تەوەری كەشتی بۆ
سزادانی. (٢) بەرزكردنەوەو پیشاندان لەسەر تەوقەسەری تەوەری كەشتی.

**mastic** (mas′tik), ***n.*** (١) مەستەكی: جەوییەكە لە جۆرە درەختێك
دەگیرێ بنێشت و بۆیەو دەرمانی لێ دروست دەكرێ (٢) داری مەستەكی
(٣) عەرەقی مەستەكی. (٤) جۆرە چیمەنتۆیەكە.

**masticate** (mas′tə-kāt′), ***v.t.*** (١) جوین (خواردەمەنی).
(٢) جنین؛ شێلان

**-mastication *(n.)*; masticator *(n.)*.**

**masticatory** (mas′ti-kə-tôr′i, mas′ti-kə-tō′ri), *adj.* بۆ
جوین بەكاردەهێنرێ (دەم، ددان)؛ تایبەت بە كرداری جوین.
***n.*** بنێشت؛ شتێك كە دەجوورێ بۆ تف زیادكردن.

**mastiff** (mas′tif, mäs′tif), ***n.*** سەگێكی گەورەو بەهێزی پێست
لووسی گوێ شۆڕی ڕاو و پاسە.

**mastitis** (mas-tī′tis), ***n.*** هەوكردنی مەمك

**masto-** (mas′tō, mas′tə), *Also* mast-, پێشگرێكە بەمانای:

مەمك؛ تایبەت بە مەمك یا گوان؛ گۆی مەمك.

**mastodon** (mas′tə-don′), ***n.*** گیاندارێكی قڕتێكەوتووە لە توخمی فیل.

**mastoid** (mas′toid), ***adj.*** (١) مەمكی؛ گۆمەمكی

(٢) چوكڵەگۆیی؛ تایبەتی بە ئێسقانی پشت گوێچكە كە لە گۆی مەمك دەچێ.

***n.*** (١) ئێسقانی پشت گوێچكە كە لە گۆی مەمك دەچێ.

(٢) [Colloq.]. **mastoiditis**

**mastoidectomy** (mas′toid-ek′tə-mi), ***n.*** لابردنی ئێسقانی پشت گوێچكە بە نەشتەرگەری.

**mastoiditis** (mas′toid-ī′tis), ***n.*** هەوكردنی ئێسقانی پشت گوێچكە كە لە گۆی مەمك دەچێ.

**masturbate** (mas′tẽr-bāt′), ***v.i.*** دەسپەڕكردن؛ ئاوهێنانەوە.

**masturbation** (mas′tẽr-bā′shən), ***n.*** دەسپەڕ؛ ئاوهێنانەوە؛ ئاوی خۆ هێنانەوە.

**mat** (mat), ***n.*** (١) حەسیر؛ ڕاخەر؛ بەڕە. (٢) **doormat** .

(٣) پارچە تەنراوێكی قوماش یا پووشە دەخرێتە ژێر قاپەوە لەسەر مێزی نانخواردن (٤) ژێرخەرێكی ئەستووری نەرمە لە وەرزشگادا بۆ زۆرانبازی و هەڵبەزودابەز لەسەركردن.

(٥) شتی چنگ لەیەكداوی چڕ (قژ): *( a ~ of hair)*

***v.t.*** (١) پارچە حەسیر یا فەرش لەسەر ڕاخستن.

(٢) تەنین و ئاڵۆزاندن پێكەوە.

***v.i.*** پێكەوە تەنران و چنگ دانە یەك.

**mat** (mat), ***adj.*** بێ بریقە؛ بێ ڕەنگ؛ مردوو (ڕەنگ).

***n.*** (١) ڕوویەكی بێ بریقە؛ ڕووكاری بێ ڕەنگ.

(٢) پەراوێزێكی بێ بریقەیە دەخرێتە نێوان وێنەیەك و چوارچێوەیەك.

***v.t.*** پەرداخ كردنی ڕووكارێك بەبێ بریقە.

**matador** (mat′ə-dôr′), ***n.*** ماتەدۆر: زۆرانبازی گای ئیسپانی (كە كەڵەگاكە دەكوژێ پاش یاری پێكردنی).

**match** (mach), ***n.*** (١) پلیتە (تەقەمەنی) (٢) دەنكە شقارتە.

**match** (mach), ***n.*** (١) هاوتا؛ هاوسەنگ؛ حەریف

(٢) تاكی جووتە شت یا مرۆڤی لەیەكچوو.

(٣) جووت (شت یا كەسی بۆ یەكتر شیاو):

*( Her purse and shoes were a good ~ .)*

(٤) ملەملێ؛ پێشبڕكێ

(٥) (ا) شووكردن؛ ژنهێنان: *( She made a good ~ )* .

(ب) ڕێكخستنی كچ و كوڕ (بۆ خواستن).

(٦) كەسێك كە بۆ هاوسەر بشێت؛ كچێك كە بۆ هێنان باش بێت؛ كوڕێك كە بۆ شووپێكردن باش بێت.

***v.t.*** (١) ژن بۆ دۆزینەوە؛ مێرد بۆ دۆزینەوە؛ ڕێكخستنی كچ و كوڕێك بۆ ژنهێنان؛ لێ مارەكردن (٢) (ا) بەرەنگاربوون

(ب) ملەملێ لەگەڵ كردن؛ شان لە شان دان:

*( He can ~ anybody in his specialty.)*

(٣) هاوچاو بۆ دۆزینەوە؛ هاوتاكردن؛ حەریف بۆ دۆزینەوە.

(٤) لەیەكچوون *( The markings on the stamps ~ each other.)* .

(٥) لێ هاتن (جل و بەرگ)؛ لەگەڵ یەك گونجان؛ بۆ یەك شیان:

*( The coat ~es the dress.)*

(٦) لەیەكچوواندن *( I want to ~ this cloth.)*

(٧) شێروخەت كردن. (٨) بەراووردكردن

***v.i.*** (١) ژنهێنان؛ شووكردن

(٢) لەیەكچوون؛ لەگەڵ یەك گونجان؛ بۆ یەك شیان؛ لەیەككردن.

*( The colors ~ . ; The description ~es.)*

**matchbox** (mach′boks′), ***n.*** قوتووە شقارتە؛ شقارتە.

**matchless** (mach′lis), ***adj.*** بێ هاوتا؛ بێ وێنە.

**matchmaker** (mach′māk′ẽr), ***n.*** شقارتە درووستكەر

**matchmaker** (mach′māk′ẽr), ***n.*** (١) ژن و مێرد بۆ خەڵك دۆزەرەوە؛ ڕێكخەری كچ و كوڕ بۆ ژنهێنان.

(٢) ڕێكخەری زۆرانبازی و بۆكسبازی.

**-matchmaking** *(n. & adj.).*

**match point,** دوا خاڵی بردنەوەی هاوبڕكێیەك (یاری تەنس).

**mate** (māt), ***n.*** (١) ئاوەڵ؛ هاودەم؛ هاوڕێ:

*( classmate, roommate)*

(٢) لنگ یا تاكی جووتێك شت: *( the ~ to this glove)* .

(٣) هاوسەر؛ ژن؛ مێرد.

(٤) نێرە یا مێیەی دوو باڵندە یا گیانداری جووت بوو.

(٥) [Archaic]، هاوتا؛ هاوسەنگ

(٦) یاریدەدەری كاپتنی كەشتی: [ chief ( second, third ) ~ ]

(٧) یاریدەدەر (لەسەر كەشتی): *( the cook's ~ )* .

***v.t.*** (١) جووت كردن؛ یەكخستن؛ یەك پێگرتن.

(٢) بوون بە ژن و مێرد؛ شووپێكردن؛ ژنهێنان.

(٣) جووت پێگرتن؛ لێنان (وولاخ)؛ كەڵدان؛ لێ چاكردن؛ لێ پەڕاندن.

***v.i.*** (١) بوون بە ژن و مێرد؛ جووت بوون؛ گاین.

(٢) جووت بوون (نێرومێی باڵندە و گیاندار)؛ پێوەبوون؛ زاوزێ كردن:

*( Some animals ~ in the spring.)*

**mate** (māt), ***n.***, ***interj.***, ***v.t.*** = **checkmate.**

**mater** (mā′tẽr, mä′tẽr), ***n.*** [Chiefly British Obsolete], = **mother.**

**material** (mə-têr′i-əl), ***adj.*** (١) بەرجەستە؛ بەرجەستەدار:

*( a ~ object ; a ~ evidence)*

(٢) (ا) لەشی؛ جەستەیی: *( ~ pleasures)* .

(ب) هی جیهانی (وەك شت و پارە و پلەوپایە) نەك گیانی: *( ~ success)* .

(٣) گرنگ؛ سەرەكی.

***n.*** (١) كەرەسە؛ شت: *( raw ~ )* .

(٢) قوماش؛ كوتاڵ. (٣) *(pl.)*، ئامێر؛ كەرەسە: *( writing ~s)* .

(٤) شتومەك.

**materialism** (mə-têr′i-əl-iz′m), ***n.*** (١) فەلسەفەی ماددی.

(٢) پارەپەرستی؛ شت پەرستن؛ ماددە پەرستی.

**materialist** (mə-têr′i-əl-ist), ***n.*** (١) بڕوابوو بە فەلسەفەی ماددی.

(٢) پارەپەرست؛ ماددەپەرست.

**materialistic** (mə-têr′i-ə-lis′tik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە فەلسەفەی ماددی. (٢) پارەپەرست؛ ماددەپەرست؛ پوولەكی.

**-materialistically** *(adv.).*

**materiality** (mə-têr′i-al′ə-ti), ***n.*** (١) بەرجەستەیی؛ بەرجەستەداری. (٢) لەش؛ ماددە.

**materialize** (mə-têr′i-ə-līz′), ***v.t.*** (١) لەش بە بەرداكردن؛ گیان بە بەرداكردن. (٢) هێنانەڕووی فریشتەیەك یا گیان بە بەرداكردنی.

***v.i.*** (١) هاتنەدی؛ سەرگرتن: *( Our plans did not ~ .)* .

(٢) هاتنەڕوو بە لەشەوە (فریشتە، دێوودرنج).

**-materialization** *(n.).*

**materially** (mə-têr′i-əl-i), ***adv.*** (١) لەڕووی ناوەڕۆكەوە نەك شێوە

(٢) تایبەتی بە شتی بەرجەستەدار.

(٣) تا ڕادەیەكی زۆر؛ ئێجگار؛ زۆر:

*( His testimony is ~ different from hers.)*

**materiel, matériel** (mə-têr′i-el′), ***n.*** (١) كەرەسە (بەتایبەتی هی دەزگایەك). (٢) كەرەسە و چەكی سوپایی.

**maternal** (mə-tũr′n′l), ***adj.*** (١) دایكی؛ دایكانە: *( ~ instinct)* .

(٢) لە دایكەوە بۆ ماوە؛ دایكی.

(٣) دایكی؛ لە دایكەوە: *( ~ aunt, grandparents, etc.)* .

**maternity** (mə-tũr′nə-ti), ***n.*** (١) دایكێتی؛ دایكایەتی؛ دایكی.

(٢) هەستی دایكایەتی؛ خۆشەویستی دایكایەتی

***adj.*** هی منداڵبوون؛ هی سكپڕی و منداڵبوون:

*( a ~ dress, ward, hospital, leave, etc.)*
**maternity hospital,** نەخۆشخانەی منداڵبوون؛ زاینگە.
**math** (math), *n.* [Colloq.]. = **mathematics.**
**mathematical** (math´ə-mat′i-k'l), *adj.* (١) بیرکاری؛
هی ژمارەوپێوان. (٢) وورد؛ تەواو؛ بێ کەموزیاد.
**-mathematically** *(adv.).*
**mathematician** (math´ə-mə-tish′ən), *n.* زانای بیرکاری؛
بیرکارناس؛ زانای ژمارەوپێوان.
**mathematics** (math´ə-mat′iks), *n.pl.* زانستی بیرکاری؛
ژمارەوپێوان
**matin** (mat′in), *n.* (١) *(pl.)* نوێژی بەرەبەیان (کڵێسەی کاسۆلیکی).
(٢) [Poetic]. خوێندنی بەیانیانی باڵندە
*adj.* (١) تایبەتی بە نوێژی بەرەبەیان. (٢) هی بەیانی؛ هی بەیانیان.
**-matinal** *(adj.).*
**matinee, matinée** (mat′'n-ā´, mat′'n-ā´), *n.* نوواندنێک،
بەرنامەیەک یا پیشاندانێکی بە ڕۆژ (بەتایبەتی شانۆنامەیەک یا فیلمێکی پاش
نیوەڕۆ).
**matinee idol,** ئەکتەرێکی قۆز کە ژن زۆر حەز لە فیلمەکانی دەکەن و
دەیپەرستن
**matrass** (mat′rəs), *n.* شووسەیەکی مل باریکە بۆ دڵۆپاندن.
**matri-** (mā′tri, mat′ri), . پێشگرێکە بەمانای: دایک *( matriarch)*
**matriarch** (mā′tri-ärk´), *n.* دایکە سەرۆک: ئافرەتێکە کە
سەرگەورەی خێزان یا خێڵەکەیەتی.
**-matriarchal** *(adj.)*; **matriarchic** *(adj.).*
**matriarchate** (mā′tri-är´kit), *n.* (١) خێزانێک یا خێڵێک کە
ئافرەت سەرگەورەی بێت. (٢) ڕژێمێک کە بە سەرۆکایەتی ئافرەت بێت.
**matriarchy** (mā′tri-är´ki), *n.* (١) ڕژێمی دایک سالاری: ڕژێمێکی
کۆمەلایەتییە کە سەرۆکایەتی خێزان و خێڵ دەدات بە ئافرەت وە لەم ڕژێمەدا
بنەچەش لەڕێی دایکەوە دەدۆزرێتەوە نەک باوک. (٢) **matriarchate** .
**matricide** (mā′trə-sīd´, mat′rə-sīd´), *n.* (١) دایکی خۆکوشتن.
(٢) دایکی خۆکوژ
**-matricidal** *(adj.).*
**matriculant** (mə-trik′yoo-lənt), *n.* قوتابی وەرگیراو لە زانکۆ.
**matriculate** (mə-trik′yoo-lāt´), *v.t.* وەرگرتن لە زانکۆ (پاش
تاقیکردنەوەی تایبەتی).
*v.i.* وەرگیران لە زانکۆ
**matriculation** (mə-trik´yoo-lā′shən), *n.* (١) وەرگرتن یا
وەرگیران لە زانکۆ. (٢) تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆ.
**matriculator** (mə-trik′yoo-lā´tẽr), *n.* = **matriculant.**
**matrilineal** (mā´trə-lin′i-əl, mat´rə-lin′i-əl), *adj.* لەڕێی
دایکەوەیە نەک باوک (بنەچە، خزمایەتی)
**matrimonial** (mat´rə-mō′ni-əl), *adj.* هی ژنهێنان و شووکردن؛
هی ژن و مێردایەتی
**matrimony** (mat′rə-mō´ni), *n.* (١) ژنهێنان و شووکردن؛ ژنهێنان؛
شووکردن. (٢) ژن و مێردایەتی.
(٣) ژیانی ژن و مێردایەتی
(٤) جۆرە یارییەکی کاغەز یا قومارە.
**matrix** (mā′triks, mat′riks), *n.* (١) منداڵدان؛ تێزانگ.
(٢) سەرچاوە؛ نیشتمان؛ زێد؛ شوێنی لێوە پەیدابوون.
(٣) (ا) ئەو کونجەی ژێرزەمین یا سەرزەمین کە بەردی بەنرخی تێدا چەسپیوە.
(ب) قاڵب. (ج) قاڵبی تیپی چاپەمەنی.
(٤) (ا) ماددەی نێوان شانەکانی گیاندار و ڕووەک.
(ب) ئەو شانانەی نینۆک و ددانیان لێوە پەیدا دەبێ.
**matron** (mā′trən), *n.* (١) ژنی مێردار؛ ژنی قەیرە؛
ژنێکی منداڵداری بەساڵداچوو؛ کەیبانوو.
(٢) بەڕێوەبەری قوتابخانە، نەخۆشخانە، یا بەندیخانە (ئافرەت).
**matronize** (mā′trən-īz´, mat′rən-īz´), *v.t.* سەرپەرشتی کردن
وەک دایک بۆ منداڵەکەی.
**matronly** (mā′trən-li), *adj.* (١) سەلار (ئافرەت)؛ سەنگین؛
بە شەرم و شکۆ. (٢) تایبەتی بە ئەرکی سەرپەرشتی (ئافرەت)
**matron of honor,** بەربووک.
**mat** (mat), *n.* پەرداخ کردنێکی بێ ڕەنگ.
**matte** (mat), *n.* تێکەلاوێکی کانزاییە.
**matted** (mat′id), *adj.* (١) چڕوچنگ لەیەک داو و پەستراوە:
*( ~ hair)*
(٢) پەراوێزی بۆ کراوە (وێنەی لە چوارچێوە گیراو).
**matter** (mat′ẽr), *n.* (١) شت؛ ماددە. (٢) کەرەسە.
(٣) ناوەڕۆکی نووسراوێک نەک شێوازەکەی
(٤) هەند؛ بڕ: *( a ~ of a few days)* .
(٥) مەسەلە؛ باس: *( business ~s )* .
(٦) (ا) شتێکی گرنگ؛ مەسەلەیەکی گرنگ.
(ب) گرنگی: *( It's of no ~ .)* .
(٧) ( **the** ~ )، کێشە؛ ناخۆشی؛ گیروگرفت؛ مەسەلە (ناخۆشی):
*( What's the ~ ?)*
(٨) پۆستە: *( second-class ~ )* .
(٩) (ا) کێم. (ب) پیسایی؛ گوو.
(١٠) (ا) شتی لە چاپدراو. (ب) تیپی ئامادەکراو (چاپەمەنی)
*v.i.* (١) گرنگ بوون؛ قەی کردن:
*( It doesn't ~ .; Does it really ~ what I think?)*
(٢) کێم لێ هاتن؛ گەیین (دوومەڵ).
**as a matter of fact,** لە ڕاستیدا؛ ئەوی ڕاستی بێت.
**for that matter,** لەو ڕووەوە؛ سەبارەت بە.
**no laughing matter,** گاڵتە نییە؛ زۆر گرنگە
**no matter,** (١) گرنگ نییە؛ قەی ناکات.
(٢) لەگەڵ ئەوەشدا؛ بەبێ گوێدان بە.
**matter of course,** شتێکی ئاساییە؛ شتێکی سرووشتییە و
جێی سەرسامی نییە.
**matter-of-fact** (mat′ẽr-əv-fakt´), *adj.* بێ پێچوپەنا؛
بێ ئەملا و ئەولا؛ بەبێ هەستانە؛ بە ووشکی.
**matter of opinion,** دەکەوێتە سەر ڕای ئەو کەسە؛
هەرکەس ڕای خۆی هەیە دەربارەی.
**mattock** (mat′ək), *n.* پاچ؛ قولنگ.
**mattress** (mat′ris), *n.* (١) دۆشەک.
(٢) تەیمانێکی ئەستووری دار و گەلا و بنچکەداری تەنراوە بۆ پاراستنی قەراغی
ڕووبار لە ڕامالین و هەرەس بردن.
**maturate** (mach′oo-rāt´, mat′yoo-rāt´), *v.i.* (١) گەیین
(دوومەڵ)؛ کێم دەردان. (٢) گەیین؛ پێگەیشتن؛ کامڵ بوون.
**maturation** (mach´oo-rā′shən), *n.* (١) گەیین (دوومەڵ)؛
کێم دەردان. (٢) گەیین؛ پێگەیشتن؛ کامڵ بوون؛ هەراش بوون.
**mature** (mə-tyoor′, mə-toor′), *adj.* (١) هەراش (ڕووەک،
گیاندار)؛ گەییو. (٢) کامڵ؛ گەورە؛ هەراش؛ قەیرە:
*( a person of ~ age)*
(٣) تێگەیشتوو؛ بەجێ؛ هێمن: *( a ~ person, reaction, etc.)*
(٤) باش لێکۆڵراوە؛ باش بیرلێکراوە: *( a ~ plan of action)*
(٥) کاتی دانەوەی هاتووە: *( a ~ loan, bond, etc.)* .
*v.t.* (١) پێگەیاندن. (٢) باش لێکۆڵینەوە.
*v.i.* (١) (ا) گەیین؛ پێگەیشتن. (ب) هەراش بوون؛ گەورەبوون:
*( Girls ~ early.)*
(٢) کاتی دانەوە هاتن (بانقەنۆت).
**maturity** (mə-tyoor′ə-ti, mə-toor′ə-ti), *n.* (١) هەراشی؛

کامل بوون. (٢) گەیین؛ پێگەیشتن. (٣) لێکۆڵراوەیی
(٤) تێگەیشتر؛ لەسەرخۆیی: ( *This kind of work requires ~ .*) .
(٥) (ا) کاتی دانەوە هاتن (بانقەنۆت).
(ب) ئەم کاتی دانەوەیە.

**matzo** (mät'sō. mät'sə), *n.* ( *pl.* **matzoth, matzos** ). جۆرە نانێکی هەویرترش تێنەکراوی رەقە (جوولەکە لە هەندێ جەژندا دەیخۆن).

**maudlin** (môd'lin), *adj.* (١) بەسۆزو گرینۆك؛ هەست ناسك و گرینۆك. (٢) بەسۆزو گرینۆك لەسەرخۆشیدا.

**maul** (môl), *n.* (١) کوتەك (بۆ سنگ داچەقاندن)؛ پێك
(٢) [Archaic] گورز؛ داردەست
*v.t.* (١) (ا) لێدان؛ بریندارکردن؛ پێست شینکردنەوە.
(ب) هەڵگلۆفتن؛ گلۆفینەوە: ( *A hunter was ~ed by a bear.*) .
(٢) قلیشاندن بە پێك و پواز؛ لەتکردن (دار).

-mauler *(n.)*.

**maulstick, mahlstick** (môl'stik'), *n.* داری نیگارکێش
دارێکی درێژی باریکە نیگارکێش بۆ لەنگەر بەکاری دەهێنێ

**maund** (mônd), *n.* مەن (کێشان)

**maunder** (môn'dēr), *v.i.* (١) سوورانەوە؛ خول خواردن.
(٢) وورێنەکردن؛ قسەی بێ سەروبەر کردن.

**mausoleum** (mô'sə-lē'əm), *n.* گۆڕێکی گەورە (بەتایبەتی لەناو خانوویەکی جواندا)؛ گۆڕی کەسێکی مەزن؛ ئارامگای مەزن.

**mauve** (mōv), *n.* رەنگی مۆر؛ بۆیەی بنەوشەیی
*adj.* مۆر؛ خامەکی؛ بنەوشەیی.

**maverick** (mav'ēr-ik), *n.* (١) گوێرەکە یا مانگای نەسمراوی لە گاگەل وونبوو یا دابڕاو؛ گوێرەکە یا جوانووی ئاوەکی بێ خاوەن.
(٢) پارێز یا نەسپی راکردوو.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی سەربەخۆ کە مل نادات بۆ حیزبەکەی یا کۆمەڵەکەی؛ کەسێك کە خۆی جیاکردبێتەوە لە حیزب یا کۆمەڵەکەی و رێگەی سەربەخۆی گرتبێ

**mavis** (mā'vis), *n.* باڵندەیەکی دەنگ خۆشە لە توخمی رێشۆڵە.

**maw** (mô), *n.* (١) (ا) گەدە؛ وورگ (ب) گەدەی چوارەمی گیانداری کاوێژکەر. (٢) قورگ و کاژێرو سوورێنچکی گیانداری زۆرخۆر.

**maw** (mô), *n.* [Dial.], = **ma; mamma; mother.**

**mawkish** (môk'ish), *adj.* (١) دڵ تێکەڵهێنەر؛ پیس؛ زۆر بێ تام.
(٢) بەسۆز یا هەست ناسك بەشێوەیەکی بێ تام و منداڵانە.

**max.**, = **maximum.**

**maxi** (mak'si), *n.* تەنوورە یا کراسی ئاودامان.

**maxilla** (mak-sil'ə), *n.* شەویلگی سەرەوە؛
یەکێك لە دوو ئێسقانەکەی شەویلگی سەرەوە.

**maxillary** (mak'sə-ler'i, mak-sil'ə-ri), *adj.* هی شەویلگی سەرەوە
*n.* = **maxilla.**

**maxim** (mak'sim), *n.* پەند؛ پەندی پێشینان؛ قسەی نەستەق؛ ووتەی بەجێ

**maximal** (mak'sə-m'l), *adj.* ئەوپەڕی؛ ئەوپەڕ؛ پەڕی ئەوپەڕ.

**maximize** (mak'sə-mīz'), *v.t.* گەیاندنە پەڕی ئەوپەڕ؛
زیادکردن هەتا بەرزترین پلە؛ هەتا بتوانرێ زیادکردن و گەورەکردن.

**maximum** (mak'sə-məm), *n.* پەڕی ئەوپەڕ؛ ئەوپەڕ؛ زیاترین؛ زۆرترین

**maxwell** (maks'wel, maks'wəl), *n.* ماکسوێل یەکەی تەوژمی موگناتیسی

**May** (mā), *n.* (١) بەختەبارێ: باران بران؛ بانەمەڕ؛ مایس؛
مانگی پێنجەمی ساڵنامەی گریگۆری. (٢) (ا) بەهاران؛ بەهار.
(ب) لاوی؛ لاویتی؛ گەنجی؛ تافی گەنجی. (٣) [m-]، گۆێژی ئینگلیزی.
(٤) ئاهەنگی جەژنی کرێکاران (یەکی مایس)

**may** (mā), *v.* (١) لەوانەیە؛ لەوانەبوون؛ بۆی هەیە؛ بۆ هەبوون؛ رەنگە:
( *It ~ rain.*)
(٢) رێ پێدان؛ رێگەدان. ( *You ~ go.*) .
(٣) بۆ ئەوەی؛ تاکو:
( *Write to him at once so that he ~ know our plans.*)
(٤) ئاوات خواستن؛ هیوا وابوون؛ دۆعاکردن (وەك: یاخوا وابێ یا وانەبێ!)
( *M~ you be happy!; M~ he go!*)

**maybe** (mā'bi, mā'bē), *adv.* لەوانەیە؛ رەنگە؛ بەڵکو.

**Mayday** (mā'dā'), *n.* رزگارمان کەن!: شفرەی هاوارکردنە بۆ یارمەتی
لە کەشتی و فرۆکەوە لەکاتی تەنگانەدا. ( *There was no M~ call.*)
(ووشەی " S.O.S " ببینە).

**May Day,** جەژنی یەکی مایس؛ جەژنی کرێکاران.

**mayest** (mā'ist), *archaic second person singular of* **may.**

**mayhap** (mā'hap', mā'hap'), *adv.* = **maybe.**

**mayhem** (mā'hem, mā'əm), *n.* (١) بریندارکردن و پەکخستن؛
پەل برینەوە بە دەستەنقەست. (٢) کارێکی زیانبەخش و ناپەسەند؛ ئازاردان.
(٣) پشێوی.

**mayonnaise** (mā'ə-nāz', mā'ə-nāz'), *n.* مەیۆنیز:
گیراوەیەکی خەستی سپیکارە لە زەردێنەی هێلکەو سرکەو بەهارات پێکدێت
لە بابۆڵەی خواردەمەنی دەدرێت و دەخورێت.

**mayor** (mā'ēr, mâr), *n.* سەرۆکی شارەوانی؛ بەڕێوەبەری شار.

-mayoral *(adj.)*; **mayoralship** *(n.)*.

**mayoralty** (mā'ēr-əl-ti, mâr'əl-ti), *n.* پلەوپایەی سەرۆکی
شارەوانی؛ ماوەی فەرمانڕەوایی سەرۆکی شارەوانی.

**Maypole** (mā'pōl'), *n.* ستوونی مایس: دارێکی بەرزی بە گوڵ
رازاوەیە لە جەژنی یەکی مایسدا سەمای لەدەور دەکرێ.

**mayst** (māst), *archaic second person singular of* **may.**

**mazard** (maz'ērd), *n.* [Obs.], (١) سەر؛ کەللەسەر؛ کاسەی سەر.
(٢) دەموچاو.

**maze** (māz), *v.t.* [Archaic], (١) وویرکردن؛ گێژکردن؛ واق وورماندن.
(٢) سەرسام کردن؛ سەر لێ شێواندن؛ حەپەساندن.
*n.* (١) رێگەی پڕ لە پێچ و پەنا؛ رێگەی پێچ پێچاوی؛ پێچ و پلووچ؛ رێ وونە.
(٢) سەرشێواوی؛ حەپەساوی؛ واق وورماوی.

-mazy *(adj.)*.

**M.C.**, = **Master of Cermonies.**

**M.D.,** پزیشك.

**M-day** (em'dā'), *n.* = **mobilization day.,** رۆژی رەشبگیر
دەستپێکردن بۆ جەنگ.

**me** (mē; *unstressed* mi), *pron.* من (کەسی یەکەمی تاك) (رێزمان).

**mead** (mēd), *n.* خواردنەوەیەکی کحولییە.

**meadow** (med'ō), *n.* مێرگ.

-meadowy *(adj.)*.

**meadow lark,** کلاوکوڕەی مێرگ.

**meadowsweet** (med'ō-swēt'), *n.* جۆرە گوڵەباخێکی بۆنخۆشە

**meager, meagre** (mē'gēr), *adj.* (١) لەروولاواز؛ لەر:
( *a ~ face*)
(٢) کەم؛ کز: ( *a ~ meal, salary, etc.; ~ resources*) .

**meal** (mēl), *n.* (١) ژەم؛ ژەمێك خواردن؛ چێشت. (٢) کاتی نانخواردن.

**meal** (mēl), *n.* دانەوێڵەی هاڕاو: ( *corn ~* ) .

**mealie** (mēl'i), *n.* (١) (*pl.*)، گەنمەشامی. (٢) گوڵەشامی.

**meal ticket,** (١) تکتی خواردن.
(٢) [Slang]، هۆی گوزەران؛ مایەی گوزەران یا ژیان؛ پشتیوانی دارایی (کار، مرۆڤ).

**mealtime** (mēl'tīm'), *n.* کاتی نانخواردن.

**meal worm,** مۆرانەی ئارد و دانەوێڵە.

**mealy** (mēl′i), *adj.* (١) وورد وەك نارد؛ ناردی
(٢) دانەوێڵەی هاڕراوی تێدایە. (٣) بەڵەك؛ كونج كونج؛ خاڵ خاڵ؛ خاڵاوی.
(٤) سپی؛ كاڵ؛ ڕەنگ زەرد. (٥) **mealy-mouthed**.
**mealy-mouthed** (mēl′i-moutht′), *adj.* زمان لووس
**mean** (mēn), *v.t.* (١) نیازبوون؛ مەبەست بوون؛ ویستن.
*( He ~s to go.)*
(٢) مانا وابوون؛ واگەیاندن؛ واگرتنەوە؛ واتا وابوون:
*( What does this word ~ in Kurdish?)*
(٣) بریتی بوون لە؛ مایەی ئەوە بوون؛ بوون بە هۆ:
*( Money does not necessarily ~ happiness.)*
*v.i.* (١) مەبەست بوون؛ نیازبوون؛ ویستن: *( to ~ well)*.
(٢) بایەخ بوون؛ گرنگ بوون: *( Money ~s little to me.)*.
**mean well by,** هەستی باش‌و برایانەو چاكە ویستن.
**mean** (mēn), *adj.* (١) گەنگ؛ ڕەشۆكی؛ بازاڕی؛ قەڵب:
*( He is no ~ scholar.)*
(٢) هەژار؛ نزم (پلەوپایە): *( of ~ birth)*.
(٣) بێ شكۆ. (٤) بێ بایەخ؛ بێ نرخ؛ هیچ‌وپووچ.
(٥) پەڕپووت (ڕووخسار)؛ ناشرین؛ بێ فەڕ:
*( a ~ house in a ~ street)*
(٦) بەد؛ ناپەسەند؛ ناكەس؛ ناپیاو؛ نامەرد؛ نزم.
(٧) ڕەزیل؛ پیسكە؛ پوولەكی.
(٨) سەركێش (ئەسپ): *( a ~ horse)*.
(٩) [Colloq.]، ناپەسەند؛ بەدخو؛ دڕ؛ تووڕەوتیژ؛ بەدسرووشت؛ ڕووگرژ؛ دڵڕەق؛ شەڕەنگێز؛ خراپ (ڕەفتار لەگەڵ خەڵكدا):
*( a ~ remark; Don't be so ~ to your little brother.)*
(١٠) [Colloq.]، شەرمەزار.
(١١) [Colloq.]، نەخۆش.
(١٢) [Slang]، (ا) قایم؛ ناگەڕێنرێتەوە (تۆپی یاری)؛ سەخت:
*( He throws a ~ ball.)*
(ب) لێهاتوو؛ كارامە؛ شارەزا.
**mean** (mēn), *adj.* (١) ناوەڕاست؛ ناوەند. (٢) مام ناوەندی؛ ناوەندی.
*n.* (١) ناوەڕاست (٢) نێوانڕۆیی؛ میانڕۆیی. (٣) تێكڕا (ژمارەوپێوان).
**meander** (mi-an′dẽr), *n.* (١) ڕێگە یا ڕێبازی خواروخێچ؛ چەم یا ناوەڕۆی پێچاوپێچ. (٢) سووڕانەوە؛ گەڕان.
(٣) نەخشەی پێچاوپێچ.
*v.i.* (١) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ بە خواروخێچی ڕۆیشتن:
*( Streams tend to ~ through level land.)*
(٢) سووڕانەوە؛ گەڕان بەبێ مەبەست:
*( ~ing through the bazar, life, etc.)*
**meandrous** (mi-an′drəs), *adj.* پێچاوپێچ (چەم، ڕووبار، ڕێگە)؛ خواروخێچ.
**meaning** (mēn′iŋ), *n.* (١) واتا؛ مانا: *( the ~ of a word)*.
(٢) [Archaic]، مەبەست؛ نیاز.
*adj.* (١) واتادار؛ گرنگ؛ مانابەخش. (٢) بە مەبەست.
**meaningful** (mēn′iŋ-f′l), *adj.* واتادار؛ مانابەخش؛ گرنگ؛ بەنرخ؛ پڕ مانا *( a ~ experience)*.
**meaningless** (mēn′iŋ-lis), *adj.* بێ مانا؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ.
**meanness** (mēn′nis), *n.* (١) گەنگی؛ بێ نرخی؛ قەڵبی؛ بێ فەڕی.
(٢) ڕەزیلیتی؛ پوولەكیتی؛ خۆپەرستی. (٣) بەدخوازی؛ ناپەسەندی؛ دڵڕەقی؛ ڕووگرژی؛ كینە لە دڵ؛ خراپی (ڕەووشت). (٤) كارێكی ناپەسەندی دڵڕەقانەی كینە لە دڵانەی بەدخوازانە.
**means** (mēnz), *n.pl.* (١) هۆ؛ ڕێگە؛ ڕێباز: *( a ~ to an end)*.
(٢) سەرمایە؛ سامان؛ پارە؛ داهات؛ دەرامەت؛ دەسكەوت:
*( He's a man of ~.; to live within one's ~ )*
**by all means,** بێ گومان؛ مسۆگەر؛ بە مسۆگەری.
**by any means,** هەرچۆنێك بێت؛ بە هەرشێوەیەك بێت؛ بە هەرجۆرێك بێت.
**by means of.** بەهۆی؛ لەڕێگەی.
**by no means,** بە هیچ جۆرێك؛ بە هیچ ڕەنگێك؛ بە هیچ كلۆجێك.
**means to an end,** هۆی بە مەبەست گەیشتن؛ هۆی دەستكەوتنی ئامانجێك.
**meant** (ment), *past tense and past participle of* **mean.**
**meantime** (mēn′tīm′), *adv.* (١) لەو كاتەدا. (٢) لە هەمان كاتدا.
*n.* ماوەی نێوان دوو كات.
**meanwhile** (mēn′hwīl′), *adv. & n.* = **meantime.**
**measles** (mē′z′lz), *n.pl.* سوورێژە.
**measly** (mēz′li), *adj.* (١) سوورێژەیەتی.
(٢) [Slang]، كەم؛ زۆر كەم؛ هیچ‌وپووچ: *( a ~ tip)*.
**measurability** (mezh′ẽr-ə-bil′ə-ti), *n.* بۆ پێوان یا ئەندازە گرتن شیان.
**measurable** (mezh′ẽr-ə-b'l), *adj.* (١) دەپێورێ؛ ئەندازەی دەگیرێ؛ دەتوانرێ بپێورێت.
(٢) زۆر؛ ئەوتۆ: *( a ~ amount of rain)*.
**measurably** (mezh′ẽr-ə-bli), *adv.* تا ڕادەیەكی زۆر؛ زۆر؛ ئێجگار: *( His health has improved ~.)*.
**measure** (mezh′ẽr), *n.* (١) ئەندازە (پانی، درێژی، بەرزی، قەبارە، ئەستووری، سەنگ... هتد). (٢) پێوان. (٣) پێوانە؛ ئەندازە؛ كێشانە.
(٤) هەندە؛ بڕێكی تایبەتی یا دیاریكراو.
(٥) (ا) ڕادە یا سنووری دیاریكراو: *( Remain within ~.)*.
(ب) ڕادە یا ئەندازەی بەجێ: *( She grieved beyond ~.)*.
(٦) ڕادە: *( in large ~)*.
(٧) هەنگاو؛ هەڵسان بە كارێكی پێویست؛ تەقەلا؛ تەگبیر:
*( We have to take ~s to deal with the problem.)*
(٨) گەڵاڵەی یاسا؛ گەڵاڵەنامە؛ یاسا.
(٩) كێش (هۆنراوە).
(١٠) سەمای لەسەرخۆ؛ جوولەیەكی ئەم جۆرە سەمایە.
(١١) ژمارەی بەسەردا دابەشكراو بەبێ ئەوەی هیچی بمێنێتەوە (ژمارەوپێوان).
(١٢) كێش (مۆسیقا). (١٣) پانی شەقڵ یا لاپەڕە (چاپەمەنی).
*v.t.* (١) ئەندازەگرتن؛ پێوان؛ كێشان.
(٢) ( **~ off; ~ out** )، جیاكردنەوە بە پێوان یا ئەندازەگرتن.
(٣) هەڵسەنگاندن: *( He ~d his foe)*.
(٤) بەراووردكردن: *( I'll ~ my talent against his.)*.
(٥) بە باڵاكرتن؛ بە قەدگرتن.
(٦) ڕاگرتن (كات)؛ ژماردن (كاتژمێر): *( A clock ~s time.)*.
(٧) گونجاندن بەپێی ئەندازەیەك.
(٨) لێكدانەوە.
(٩) بڕین (ڕێگە، ماوە)؛ پێدا تێپەڕبوون.
*v.i.* (١) ئەندازەگرتن؛ پێوان؛ كێشان.
(٢) ئەوەندە بوون یا دەرچوون (درێژی‌و پانی... هتد):
*( This room ~s thirty feet across.)*
**beyond measure,** لە ئەندازە بەدەر؛ ئێجگار زۆر.
**for good measure,** بە سڵاوەوە (پێوان، كێشان).
**in a measure,** تا ڕادەیەك؛ ئەختێك.
**in great measure,** = **in (a) large measure.**
**in (a) large measure,** تا ڕادەیەكی زۆر.
**in some measure,** تا ڕادەیەك.
**made to measure,** دەستكرد (جل‌وبەرگ)؛ بە پێوانە دروستكراو.
**measure out,** دابەشكردن بە پێوانە.
**measure up to,** لەو پلەیەدا بوون؛ توانا بەسەردا شكان؛ دەرهەقەت هاتن (كردار، مەترسی، مرۆڤ... هتد):
*( to measure up to a job, challenge, someone's expectations,*

***task, etc.)***

**take measures,** هەنگاوی پێویست نان؛ هەڵسان بە کاری پێویست؛ کەوتنە خۆ.

**take one's measure,** هەڵسەنگاندن

**measured** (mezh′ẽrd), ***adj.*** (١) پێوراو؛ ئەندازە گیراو.
(٢) (ا) ڕێك‌وپێك؛ چوونیەك.
(ب) ووردو لەسەرخۆو بەردەوام: ***( He walked with ~ steps.)*** .
(٣) کێشدار (هۆنراوە).
(٤) باش بیرلێکراوە؛ بە ئەندازەو هێمنانەو وورییایانە کراو یا ووتراو؛ بە ژمارە (مەجاز): ***( ~ words; a ~ speech, response, etc.)*** .
(٥) دەسەنقەست.
(٦) کەم.

**measureless** (mezh′ẽr-lis), ***adj.*** بێ ئەندازە؛ لە ڕادە بەدەر؛ لە ئەندازە بەدەر؛ بێ شومار؛ ئێجگار زۆر یا گەورە.

**measurement** (mezh′ẽr-mənt), ***n.*** (١) ئەندازەگرتن؛ پێوان.
(٢) (ا) ئەندازە یا قەبارە بەپێی پێوان‌و کێشان.
(ب) (*pl.*)، ئەندازە: ***( a person's ~ )*** .
(٣) پێوانە؛ کێشانە؛ ئەندازە؛ سەنگ.

**meat** (mēt), ***n.*** (١) خواردەمەنی؛ خۆراك؛ خواردن: ***( ~ and drink)*** .
(٢) گۆشت (هی گیانداری چوارپێ). (٣) گۆشتی میوەهات.
(٤) ناوکرۆك؛ ناوەڕۆك؛ کرۆك: ***( the ~ of a story)*** .
(٥) ژەم (بەتایبەتی نانی ئێوارە).
(٦) [Slang]، کارێك یا شتێك کە کەسێك شارەزایی تێدا بێت‌و حەزی لێ بکات: ***( Tennis is his ~ .)***

**meat-ball** (mēt′bôl′), ***n.*** (١) کفتە؛ گۆشتی قیمەی خڕ هەڵدراوی ئەوەندەی گوێزێك. (٢) [Slang]، کەسێکی کەرو بێ مێشك.

**meatless** (mēt′lis), ***adj.*** (١) بێ گۆشت؛ گۆشتی تێدا نییە.
(٢) گۆشتی تێدا ناخورێ: ***( a ~ day)*** .

**meatman** (mēt′man′), ***n.*** گۆشتفرۆش.

**meatus** (mi-ā′təs), ***n.*** کون یا بۆری ناولەش (کونەگوێ، بۆری میزە).

**meaty** (mēt′i), ***adj.*** (١) گۆشتی؛ تامی گۆشت دەدات؛ لە گۆشت دەچێ.
(٢) (ا) پڕ لە گۆشت. (ب) گۆشتن؛ قەڵەو.
(٣) مێشك بزوێن؛ خەورەوێن؛ ناوکرۆکی زۆرە (مەجاز): ***( a ~ subject for study and debate)***

**-meatiness** ***(n.).***

**Mecca, Mekka** (mek′ə), ***n.*** (١) مەککە.
(٢) [m-]، (ا) شوێنێکە کە گەلێك کەس بۆی دەچن؛ قیبلە.
(ب) شوێنێکە کە مرۆڤ ئاواتەخوازە ببیبینێ. (ج) ئاوات؛ ئامانج.

**mechanic** (mə-kan′ik), ***adj.*** [Archaic], (١) هی ئیشی دەستی
(٢) هی مەکینە

***n.*** (١) فیتەر؛ مەکینەچی (٢) [Archaic]، (ا) پیشەگەر.
(ب) کەسێکی پیسی بۆگەن.

**mechanical** (mə-kan′i-k'l), ***adj.*** (١) مەکینەیی؛ تایبەت بە مەکینە. (٢) بە مەکینە درووستکراو. (٣) هی مەکینەکاری.
(٤) بیرکردنەوەی ناوێ؛ ئۆتۆماتیکی؛ لە خۆوە یا خوومرەیە: ***( a ~ act)*** .
(٥) [Archaic]، (ا) هی پیشەی دەستی.
(ب) هی پیشەگەران؛ هی چینی وەستاو کرێکاران. (ج) نزم؛ پیس‌و بۆگەن.

**mechanically** (mə-kan′i-k'l-i), ***adv.*** (١) بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی؛ لە خۆوە. (٢) لەڕووی مەکینەو کارکردنییەوە: ***( There is nothing wrong with the car ~ .)***
(٣) دەربارەی مەکینەو مەکینەکاری؛ دەربارەی شارەزایی مەکینەکاری: ***( He is ~ inclined.)***

**mechanician** (mek′ə-nish′ən), ***n.*** مەکینەچی؛ مەکینەناس؛ ئەندازیاری مەکینە.

**mechanics** (mə-kan′iks), ***n.pl.*** (١) زانستی بزووتن‌و کارکردنە سەر ووزە بۆ سەر لەش (فیزیا)
(٢) مەکینەکاری؛ زانست‌و پیشەی مەکینەکاری.
(٣) چۆنێتی کردنی شتێك؛ لایەنی کردەنی کارێك کە بیرکردنەوەی زۆر ناوێت: ***( the ~ of writing)***

**mechanism** (mek′ə-niz'm), ***n.*** (١) پارچەکانی مەکینەیەك‌و کارکردنیان پێکەوە: ***( the ~ of a clock)*** .
(٢) (ا) کۆئەندام. (ب) شێوەی بە ئەنجام هێنان.
(٣) لایەنی تەکنیکی.
(٤) بیروباوەڕ یا فەلسەفەیەکە دەڵێت: ژیان‌و جیهان لەڕێگەی فیزیا و کیمیاوە لێکدەدرێتەوە.

**mechanistic** (mek′ə-nis′tik), ***adj.*** مەکینەیی؛ تایبەتی بە مەکینەو مەکینەناسی و بیروباوەڕی مەکینەپەرستی.

**mechanize** (mek′ə-nīz′), ***v.t.*** (١) وەك مەکینە لێکردن.
(٢) بە مەکینە بەرهەم هێنان لەباتی دەست: ***( to ~ agriculture)*** .
(٣) مەکینە بەکارهێنان لە کارگەدا (٤) کەرەسەی جەنگ دان بە سوپا.

**-mechanization** ***(n.).***

**medal** (med′'l), ***n.*** نیشان؛ مەدالیا

***v.t.*** مەدالیا پێدان.

**medalist, medallist** (med′'l-ist), ***n.*** (١) مەدالیاچی؛ نیشان درووستکەر. (٢) نیشان وەرگر؛ مەدالیا بەرەوە؛ مەدالیا پێ بەخشراو.

**medallion** (mə-dal′yən), ***n.*** (١) مەدالیای گەورە؛ مەدالیا.
(٢) نەقشێکی خڕ یا هێلکەیییە فەرش‌و قوماش‌و شتی تەنراوی پێ دەڕازێنرێتەوە.

**meddle** (med′'l), ***v.i.*** (١) ( ~ in; ~ with )، دەست تێوەردان؛ دەست خستنە ناو کاروباری خەڵکەوە؛ خۆتێهەڵقورتان؛ تێهەڵچوون؛ دەست تێکێشان: ***( Don't ~ in other people's affairs.)*** .
(٢) ( with ~ )، دەست تێوەدان؛ دەستکاری کردن.
(٣) [Obs.]، (ا) چوونە ناو؛ تێکەڵاوبوون. (ب) بەربەرەکانی کردن.

**-meddler** ***(n.).***

**meddlesome** (med′'l-səm), ***adj.*** خۆتێهەڵقورتێنەر؛ دەست تێوەردەر.

**media** (mē′di-ə), ***n.*** *alternative plural of* **medium.**

**media** (mē′di-ə), ***n.*** پەردەی ناوەڕاستی دیواری بۆری خوێن.

**mediacy** (mē′di-ə-si), ***n.*** (١) (ا) ناوەڕاستێتی؛ ناوەندێتی.
(ب) ناڕاستەوخۆیی پەیوەندی (٢) ناوبژێکاری؛ ناوبژی کردن.

**mediaeval** (mē′di-ē′v'l, med′i-ē′v'l), ***adj.*** = **medieval.**

**medial** (mē′di-əl), ***adj.*** (١) ناوەڕاستی؛ هی ناوەڕاست؛ ناوەندی.
(٢) ناوچەقی. (٣) (ا) مام ناوەندی؛ ناونجی. (ب) ئاسایی.

***n.*** (١) (ا) تیپی ناوەڕاستی ووشە. (ب) شێوەی تیپی ناوەڕاست.
(٢) دەنگی تیپی ( b, d, g ) لە ناوەڕاستی ووشەدا.

**median** (mē′di-ən), ***adj.*** (١) ناوەڕاست؛ ناوەڕاستی؛ ناوەندی.
(٢) تایبەتی بە هێڵێك کە وێنەیەکی ئەندازەیی وەك سێگۆشە یا لەشێك دەکات بە دوو کەرتی یەکسانەوە لەسەر باری درێژی. (٣) هی ژمارەی ناوەڕاستی ڕیزە ژمارەیەك (وەك ژمارە (٩) لەم ڕیزەدا: ٢ ٤ ٥ ٩ ١٤ ١٧ ٢٠).

***n.*** (١) ژمارە، خاڵ، یا هێڵی ناوەڕاست (ئەندازە، ژمێرەکاری)؛ ناوەند.
(٢) دەماری خوێن یا هەستەدەماری ناوەند.
(٣) تیرە زەوییەکی باریکە لە ناوەندی ڕێگاوبان‌و شەقامی دووسەریدا؛ ناوەند.

**mediastinum** (mē′di-as-tī′nəm), ***n.*** (١) پەردەی نێوان سییەکان. (٢) ئەو بۆشاییییەی سنگ کە دڵ‌و هەموو ئەندامەکانی تری تێدایە جگە لە سییەکان.

**mediate** (mē′di-āt′), ***v.i.*** (١) لە ناوەڕاستدا بوون؛ لە ناوەندا بوون.
(٢) ناوبژی کردن؛ ئاشتکردنەوە؛ کەوتنە بەینەوە؛ ڕێکخستنەوە: ***( to ~ between two warring nations)***

***v.t.*** هێنانەدی لەڕێگەی ناوبژی کردنەوە: ***( to ~ a settlement)*** .

***adj.*** (١) ناوەند؛ ناوەندی؛ ناوەڕاستی. (٢) ناڕاستەوخۆ.

**mediation** (mē´di-ā′shən), *n.* ناوبژی کردن؛ ئاشتکردنەوە؛ ڕێکخستن: *( All attempts at ~ by a third party were rejected.)* .
**mediator** (mē′di-ā´tēr), *n.* ناوبژیکەر؛ ئاشتکەرەوە.
**mediatory** (mē′di-ə-tôr´i, mē′di-ə-tō´ri), *adj.* ناوبژیکەری؛ تایبەتی بە ناوبژیکەر یا ناوبژیکاری.
**medic** (med′ik), *n.* [Colloq.], (١) پزیشك؛ نەشتەرگەر. (٢) قوتابی پزیشکەوانی؛ پزیشکێکی تازە دەرچوو؛ برینپێچ. (٣) ئەندامی تیپی پزیشکەوانی سوپا.
**medic** (med′ik), *n.* = **alfalfa.**
**medicable** (med′i-kə-b'l), *adj.* بە دەرمان چارەسەر دەکرێ؛ بە دەرمان چاك دەبێتەوە.
**medical** (med′i-k'l), *adj.* (١) پزیشکی؛ پزیشکەوانی. (٢) پێویستی بە دەرمانکردنە نەك نەشتەرکاری. (٣) [Archaic]، وەك دەرمان وایە؛ چاکەرەوە.
*n.* [Colloq.], تێڕوانینی گشتی پزیشکی.
**medical examiner,** پزیشکی لێکۆڵەرەوەی یاسایی: کە لاشەی مردوو توێکاری دەکات بۆ دۆزینەوەی هۆی مردنەکەی (لە مردنی نائاساییدا وەك کوشتن و خۆکوشتن... هتد). (پێشی دەوترێ: " **coroner** ") .
**medical jurisprudence,** پزیشکەوانی یاسایی.
**medically** (med′i-k'l-i, med′ik-li), *adv.* (١) بە دەرمان. (٢) لەرووی پزیشکەوانی‌یەوە؛ لەڕووی پزیشکی‌یەوە.
**medicament** (mə-dik′ə-mənt, med′i-kə-mənt), *n.* دەرمان
**medicate** (med′i-kāt´), *v.t.* (١) دەرمانکردن. (٢) دەرمان تێکردن؛ دەرمان لێدان.
**-medicative** *(adj.).*
**medication** (med´i-kā′shən), *n.* (١) دەرمان لێدان؛ دەرمانکردن. (٢) دەرمان
**medicinal** (mə-dis′'n-'l), *adj.* چاکەرەوە؛ چارەکەر (دەرمان)؛ بۆ چارەکردنی نەخۆشی باشە؛ وەك دەرمانە: *( ~ herbs)* .
**-medicinally** *(adv.).*
**medicine** (med′ə-s'n), *n.* (١) پزیشکەوانی؛ زانستی پزیشکەوانی. (٢) دەرمان. (٣) (ا) شتێك، نەریتێك، یا جادووگەری‌یەك کە گوایە خەڵك دەپارێزیٚ و وەك دەرمان نەخۆش چاك دەکاتەوە (هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکان). (ب) ئەفسوون: هێزی جادووگەری. (٤) [Obs.]، **medicine man** .
*v.t.* دەرمانکردن؛ دەرمان پێدان؛ دەرمان لێدان.
**medicine man,** جادووگەر؛ پزیشکی جادووگەر.
**medico** (med′i-kō´), *n.* [Colloq.], (١) پزیشك؛ نەشتەرگەر. (٢) قوتابی پزیشکەوانی.
**medico-** (med′i-kō´), پێشگرێکە بەمانای پزیشکەوانی.
**medieval, mediaeval** (med´i-ē′v'l), *adj.* سەدەی ناوەڕاست؛ هی سەدەی ناوەڕاست.
**medievalism, mediaevalism** (mē´di-ē′v'l-iz'm, med-´i-ē′v'l-iz'm), *n.* (١) بیروباوەڕو نەریتی سەدەی ناوەڕاست. (٢) پەیڕەوی کردن و بڕوا پێ بوون و دڵسۆزی بۆ بیروباوەڕو نەریتەکانی سەدەی ناوەڕاست؛ سەدەی ناوەڕاست خوازی. (٣) بیروباوەڕ یا نەریتێکی سەدەی ناوەڕاست. (٤) لێکۆڵینەوەی سەدەی ناوەڕاست.
**medievalist, mediaevalist** (mē′di-ē′v'l-ist), *n.* (١) زانا یا قوتابی سەدەی ناوەڕاست؛ سەدەی ناوەڕاست ناس. (٢) سەدەی ناوەڕاست خواز.
**medio-** (mē′di-ō, mē′di-ə), *Also* **medi-,** پێشگرێکە بەمانای: ناوەند؛ ناوەندی؛ ناونجی.
**mediocre** (mē′di-ō´kēr, mē´di-ō′kēr), *adj.* مام ناوەندی؛ ناونجی؛ نە باش و نە خراپ؛ ڕەشۆکی؛ ڕەمەکی.
**mediocrity** (mē´di-ok′rə-ti), *n.* (١) مام ناوەندیتی (توانا، لێهاتوویی، چۆنێتی)؛ ڕەمەکیتی؛ نە باشی و نە خراپی. (٢) توانا و لێهاتوویی مام ناوەندی‌یانە. (٣) کەسێکی مام ناوەندی لە توانا و لێهاتووییدا.
**meditate** (med′ə-tāt´), *v.t.* (١) [Rare]، بیرلێکردنەوە. (٢) نەخشەدانان؛ وا نیازبوون؛ ویستن؛ بەتەمابوون.
*v.i.* بە قووڵی بیرکردنەوە؛ بیرکردنەوە.
**-meditator** *(n.).*
**meditation** (med´ə-tā′shən), *n.* (١) بیرکردنەوەی قووڵ؛ بە قووڵی بیرکردنەوە. (٢) بە قووڵ بیرکردنەوەی ئاینی.
**meditative** (med′ə-tā´tiv), *adj.* (١) حەزکەر لە بیرکردنەوە؛ بیرکەرەوە: *( a ~ mind)* . (٢) بیرکردنەوەیی؛ تایبەتی بە بیرکردنەوە.
**Mediterranean** (med´ə-tə-rā′ni-ən), *adj.* (١) (m-)، (ا) لە ناوەوەی وڵاتدا؛ دوور لە قەراغ دەریاوە. (ب) بە زەوی دەورگیراو (دەریا، دەریاچە). (٢) هی دەریای سپی ناوەڕاست و ناوچەی دەوروبەری: *( a M~ climate)* . (٣) هی گەلانی ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاست.
*n.* (١) دەریای سپی ناوەڕاست. (٢) کەسێکی خەڵکی ئەم ناوچەیە.
**Mediterranean Sea,** دەریای سپی ناوەڕاست.
**medium** (mē′di-əm), *n.* ( *pl.* **media** or **mediums**), (١) (ا) شتێکی مام ناوەندی یا ناونجی. (ب) پلەی ناوەڕاست یا ناوەندی؛ دۆخی ناوەندی. (٢) هۆ؛ ناوەند: *( The ether is the supposed ~ for radio waves.)* . (٣) هۆ: *( Radio is a ~ of communication.)* . (٤) (ا) ناوەند. (ب) دەوروبەر؛ شوێن. (٥) کەسێکە کە گوایە هۆی پەیوەندی‌یە لەنێوان خەڵکی مردوو و زیندوودا؛ پەیامبەری نێوان خەڵکی مردوو و زیندوو. (٦) هۆی دەربڕین (هونەر): *( This sculptor's favorite ~ is stone.)* .
*adj.* مام ناوەندی؛ ناونجی.
**medium of exchange,** هۆی ئاڵوگۆڕکردن یا گۆڕینەوە (وەك پارە یا شتێك لەجێی پارە)
**medlar** (med′lēr), *n.* گێزێ.
**medley** (med′li), *n.* (١) کۆمەڵێکی هەمەچەشنی تێکەڵاو (مرۆڤ، گیاندار، شت)؛ کۆمەڵێکی هەڕەمەی وەك چێشتی مجەور: *( What a ~ of races in America!)* (٢) پارچە مۆسیقایەك کە لە چەند پارچەیەکی بچووکی ئەساز پێکهاتبێ. (٣) [Archaic]، **melee** .
*adj.* تێکەڵاو؛ هەڕەمە؛ هەمەڕەنگ؛ هەمەجۆر.
**medulla** (mi-dul′ə), *n.* (١) (ا) مۆخ. (ب) ناوەڕۆکی هەندێ ئەندامی لەش (وەك گورچیلە و قژ... هتد). (٢) ناوەڕۆکی لیقنی قەفی هەندێ ڕووەك
**-medullary** *(adj.).*
**Medusa** (mə-dōō′sə, mə-dū′zə), *n.* (١) مەدووسە: یەکێکە لە " گۆرگۆن " ەکانی ئەفسانەی یۆنانی (وشەی " **gorgon** " ببینە). (٢) ماسی‌یە نەرمەلیقە.
**-medusan** *(adj.).*
**medusoid** (mə-dōō′soid, mə-dū′zoid), *n.* (١) شێوەیەکی وەك ماسی‌یە نەرمەلیقە. (٢) ماسی‌یە نەرمەلیقە
*adj.* لە ماسی‌یە نەرمەلیقە دەچێ.
**meed** (mēd), *n.* [Poetic], پاداشت؛ خەڵات.
**meek** (mēk), *adj.* (١) بە ئارام؛ ملکەچ. (٢) (ا) بەسزمان؛ سەرکز؛ بێ فیز. (ب) سەرشۆڕ؛ بێ غیرەت. (٣) [Obs.]، لەسەرخۆ؛ هێمن؛ دڵنەرم.
**-meekly** *(adv.)*; **meekness** *(n.).*
**meet** (mēt), *v.t.* (١) (ا) تووش بوون؛ پێ گەیشتن؛ تووش هاتن؛ بەیەکگەیشتن: *( I met him in the street.)* . (ب) تووش بوون (ناخۆشی): *( He met his fate.)* .

(۲) چوون بەپیرەوە؛ بەخێرهاتن کردن: *( He met her at the airport.)* .
(۳) (ا) ناسین بۆ یەکەم جار: *( I met her a year ago at a party.)* .
(ب) دیدەنی کردن
(٤) بەرەنگاربوون: ڕووبەڕوو وەستان: شەڕ لەگەڵ کردن؛ دەستەویەخە وەستان.
(٥) بەرپەرچدانەوە: بەرهەڵستی کردن: *( We can ~ this objection.)* .
(٦) تووش هاتن: چەشتن: هاتنەڕێ: *( Their plan will ~ disaster.)* .
(۷) هاتنە بەرچاو؛ وا دەرکەوتن.
(۸) (ا) ڕازی کردن: جێبەجێکردن: *( to ~ her wishes)* .
(ب) دانەوە (قەرز)؛ دان.
*v.i.* (۱) یەککگرتن؛ بەیەککگەیشتن؛ لە یەکتری دان:
*( The two streams ~ near our town.)*
(۲) بەرکەوتن؛ لێدان.
(۳) یەکتر ناسین: *( We met a week ago.)* .
(٤) بەرەنگاربوون: دەستەویەخە وەستان؛ ڕووبەڕوو وەستان.
(٥) بوون بەیەک؛ یەککگرتن. (٦) کۆڕگرتن؛ کۆبوونەوە.
*n.* (۱) کۆبوونەوە (وەرزش)؛ کۆڕگرتن؛ کۆڕ:
*( a swim ~ ; an athletic ~ )*
(۲) کۆڕگرتووان؛ ئەوانەی کۆدەبنەوە.
(۳) جێی کۆبوونەوە؛ جێی کۆڕ.
**meet a person halfway,** هەوڵی ڕێکەوتن دان لەگەڵ کەسێک یا لایەک بە هەڵسان بە نیوەی ئەو ئەرکانەی پێویستە بۆ ئەم ڕێکەوتنە.
**meet with,** تووش هاتن (مرۆڤ، کۆسپ، ناخۆشی)
*( to meet with misfortune)*
**meet** (mēt), *adj.* بەجێ؛ وا باشە؛ وا جوانە.
**meeting** (mēt′iŋ), *n.* (۱) کۆبوونەوە؛ یەککگرتن؛ کۆڕگرتن.
(۲) کۆڕ؛ کۆبوونەوە. (۳) (ا) کۆڕگرتووان.
(ب) جێی کۆبوونەوە (بۆ ئامانجی ئاینی).
(٤) جێگای بەیەک گەیشتن. (٥) بەرەوڕووبوونەوە بۆ شەڕ؛ شەڕە شیر.
**mega-** (meg′ə), پێشگرێکە بەمانای: (۱) گەورە؛ زل: *(megaphone)* .
(۲) یەک ملیۆن جار؛ ملیۆنێک: *( megacycle)*
**megacephalic** (meg′ə-sə-fal′ik), *adj.* سەر زل
**megacephalous** (meg′ə-sef′ə-ləs), *adj.* = **megacephalic.**
**megacycle** (meg′ə-sī′k′l), *n.* ملیۆنێک خول لە چرکەیەکدا (فیزیا).
**megalith** (meg′ə-lith′), *n.* بەردی زل کە لە پەیکەر و خانووی یادگاری زۆر کۆندا بەکاردەهێنرا.
**megalo-** (meg′ə-lō, meg′ə-lə), پێشگرێکە بەمانای: گەورە؛ زل؛ بەهێز *( megalomania, megalopolis)* .
**megalomania** (meg′ə-lə-mā′ni-ə), *n.* شێتی گەورەیی خوازی؛ شێتی خۆ بە زل زانین؛ شێتی کردنی کاری گەورە و سەرناسا.
-megalomaniac *(adj.).*
**megalopolis** (meg′ə-lop′ə-lis), *n.* شارێکی زۆر گەورە؛ کۆمەڵە شارێکی گەورەی بەتەنیشت یەکەوە.
**megaphone** (meg′ə-fōn′), *n.* بڵندگۆ؛ ئامێری دەنگ گەورەکەر.
*v.t. & v.i.* دەنگ گەورەکردن.
**megathere** (meg′ə-thēr′), *n.* گیاندارێکی گەورەی گیاخۆری قڕتێکەوتووە.
**megaton** (meg′ə-tun′), *n.* مێگاتەن: هێزێکی تەقینەوەیە ئەوەندەی هێزی تەقینەوەی یەک ملیۆن تەن لە تەقەمەنی سێهەم ئەتراتی تۆلیوین دەبێت.
**megrim** (mē′grim), *n.* (۱) **migraine** .
(۲) هەوەس: هەوەسی سەرڕەمی و حولحولی‌یانە؛ هەوەسبازی.
(۳) پەستی: مات و مەلوول؛ دڵتەنگی.
(٤) سەرەخولێ (بەتایبەتی لە ئەسپ و ئاژەڵدا)؛ سەرسووڕکێ.
(هەروەها پێنشی دەووتری: **" blind stagger "** ) .
**meiosis** (mī-ō′sis), *n.* (۱) دابەشبوونی کەمبوونەوەیی یا نیوەیی لە شانەی گیانەوەردا. (۲) **litotes** .
-meiotic *(adj.).*
**melan-,** = **melano-.**
**melancholia** (mel′ən-kō′li-ə), *n.* مێلانخۆلیا (دەروونناسی)؛ پەستی؛ مات و مەلوول؛ دڵتەنگی؛ غەمگینی.
-melancholiac *(adj. & n.).*
**melancholic** (mel′ən-kol′ik), *adj.* (۱) مات و مەلوول؛ پەست؛ دڵتەنگ؛ غەمبار؛ مێلانخۆلیای لەگەڵدایە. (۲) تایبەتی بە مێلانخۆلیا؛ لەوانەیە تووشی مێلانخۆلیا ببێت.
-melancholically *(adv.).*
**melancholy** (mel′ən-kol′ī), *n.* (۱) [Archaic] ، (ا) ڕەشاو: یەکێکە لە چوار شلەی ناو لەشی مرۆڤ کە پێشینان وایان دەزانی دەبێتە هۆی غەمباری و دڵتەنگی. (ب) نەخۆشی مێلانخۆلیا، واتە غەمباری و دڵتەنگی.
(۲) مات و مەلوول؛ غەمباری؛ پەستی؛ دڵتەنگی. (۳) بیرکردنەوەی قووڵی وەها.
(٤) [Obs.]، نەخۆشی مێلانخۆلیای لەگەڵدایە.
**mélange** (mā′länzh′), *n.* هەرەمە؛ شتی تێکەڵ و پێکەڵ.
**melanic** (mə-lan′ik), *adj.* پێست ڕەش؛ ڕەش؛ قژ و پەڕ و پێست ڕەش.
**melanin** (mel′ə-nin), *n.* ڕەنگی ڕەش (پێست و قژ و پەڕی گیاندار).
**melanism** (mel′ə-niz′m), *n.* پێست ڕەشی بەشێوەیەکی نائاسایی؛ ڕەشی چاو و پێست و قژ و پەڕ... هتد. (پێنشی دەووترێ: **" melanosis "** ) .
**melanite** (mel′ə-nīt′), *n.* جۆرە بەردێکی بەنرخە.
**melano-** (mel′ə-nō, mel′ə-nə), *Also* **melan-,** پێشگرێکە بەمانای: ڕەش؛ زۆر ڕەش؛ ڕەشی قەترانی.
**melanoid** (mel′ə-noid′), *adj.* ڕەنگ ڕەش (پێست، چاو، قژ، پەڕ).
**melanoma** (mel′ə-nō′mə), *n.* لوو، برین، یا سندانێکی ڕەشی کوشندە.
**melanosis** (mel′ə-nō′sis), *n.* ڕەشی نائاسایی پێست و شانەکانی لەش (نەخۆشی ناسی). (پێنشی دەووترێ: **" melanism "** ) .
-melanotic *(adj.).*
**melanous** (mel′ə-nəs), *adj.* پێست و قژ ڕەش.
**melaphyre** (mel′ə-fīr′), *n.* مێلافایەر: بەردێکی ئاگرپڕژێنی ڕەشباوە.
**meld** (meld), *v.t., v.i. & n.* دەست پیشاندان بۆ خاڵ ژماردن (قومار).
**meld** (meld), *v.t.* تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵ کردن.
*v.i.* تێکەڵاوبوون؛ تێکەڵ بوون؛ بوون بەیەک.
**melee, mêlée** (mā-lā′, mā′lā, mel′ā), *n.* (۱) (ا) شەڕی دەستەویەخە. (ب) شەڕە مستەکۆڵە؛ بەیەکداچوون؛ بەیەکدادان؛ بەیەکداهاتن:
*( He struck his wife and aunt, and during the ~ the baby also suffered scratches.)*
(۲) پاڵەپەستۆی جەماوەری: *( the rush-hour ~ )* .
**melic** (mel′ik), *adj.* (۱) هەڵبەست؛ هی گۆرانی و هۆنراوە.
(۲) هی هەڵبەستی گۆرانی یۆنانی.
**melilot** (mel′i-lot′), *n.* چەند جۆرە گیایەکی سێپەڕەیی بۆن خۆش و شیرینە.
**meliorate** (mēl′yə-rāt′), *v.t.* باشترکردن (جۆر، توخم، ڕەچە، نەوە)؛ چاکردن؛ پەرە پێ سەندن.
*v.i.* باشتربوون (توخم)؛ چاکتربوون.
-meliorable *(adj.)*; melioration *(n.)*; meliorative *(adj.).*
**meliorism** (mēl′yə-riz′m), *n.* (۱) ئەو بیروباوەڕەی کە دەڵێت: جیهان هەمیشە بەرەو باشی دەڕوات و مرۆڤیش دەتوانێ پەرە بسەنێ بەم چاک بوونە بە هەوڵ و تەقەلای خۆی. (۲) پەرە پێ سەندنی کۆمەڵ (لەڕێگەی نەهێشتنی نەخۆشی و بەرزکردنەوەی پلەی ژیانەوە).
-meliorist *(n. & adj.)*; melioristic *(adj.).*
**mell** (mel), *v.t. & v.i.* [Obs. or British Dial.], تێکەڵ کردن؛ تێکەڵاوبوون.
**melliferous** (mə-lif′ēr-əs), *adj.* هەنگوین بەرهەم دەهێنێ؛

هەنگوینی لێ پەیدا دەبێ.

**mellifluence** (mə-lif′lōō-əns), *n.* هەنگویناوی: شیرین؛ خۆش دەنگ، مۆسیقا).

**mellifluent** (mə-lif′lōō-ənt), *adj.* = **mellifluous.**

**mellifluous** (mə-lif′lōō-əs), *adj.* دەلۆی هەنگوینە؛ سازوشیرین (دەنگ)؛ خۆش (دەنگ، مۆسیقا، ووشە): ***( her ~ voice)*** .

**mellow** (mel′ō), *adj.* (١) گەییو (میوە)؛ شیرین و خۆش و پڕ لە ئاو؛ تەڕوبڕ پێگەییو. (٢) گەڕاوە (شەراب)؛ تام خۆش: ***( ~ wine)*** .
(٣) خۆش (دەنگ، ئاووهەوا)؛ نەرم (دەنگ)؛ دڵگیر (ڕەنگ):
***( ~ air, weather, etc.)***
(٤) شێدارو بەپیت (خاك).
(٥) لەسەرخۆو تێگەیشتوو و ژیر (بەهۆی تەمەنەوە).
(٦) [Colloq.]، ڕووخۆش؛ کوڕی باش؛ ئاسك: ***( He is a ~ guy.)*** .
(٧) [Colloq.]، سەرخۆش؛ ئەختێك سەرخۆش؛ خەیاڵی هەیە.
(٨) [Slang]، نایاب؛ زۆر چاك.

***v.t.*** گەیاندن؛ پێ گەیاندن.

***v.i.*** (١) گەیان؛ پێگەیین. (٢) بڵ بوون؛ گەیین.
(٣) گەڕانەوە (مرۆڤ)؛ هێمن بوونەوە.

**melodeon** (mə-lō′di-ən), *n.* (١) ئامێرێکی بچووکی مۆسیقای بۆریدارە وەك ئەرگۆن. (٢) جۆرێکە لە ئەکۆردیۆن.

**melodic** (mə-lod′ik), *adj.* (١) خۆش (ئاوان). (٢) **melodious** .

**-melodically** *(adv.).*

**melodious** (mə-lō′di-əs), *adj.* (١) خۆش ئاواز؛ خۆش ئەوا؛ شیرین ئاواز ***( ~ music)*** .
(٢) خۆش (دەنگ، مۆسیقا)؛ شیرین (دەنگ)؛ ساز:
***( the ~ voice of a young girl)***

**-melodiously** *(adv.).*

**melodist** (mel′ə-dist), *n.* (١) ئاوازدانەر. (٢) گۆرانی بێژ.

**melodize** (mel′ə-dīz′), *v.t.* (١) خۆش کردن (دەنگ، مۆسیقا).
(٢) ئاواز بۆ دانان.

***v.i.*** ئاواز دانان.

**melodrama** (mel′ə-drä′mə, mel′ə-dram′ə), *n.* (١) شانۆیی دڵداری یا وورووژێنەرو هەست بزوێن بە گۆرانی و مۆسیقاوە.
(٢) میلۆدراما. شانۆنامەیەکە پڕ لە کرداری وورووژێنەرو دڵداری و هەست بزوێن و گەلێك جار توندوتیژو سۆزی لە ئەندازە بەدەر کە ئەنجامەکەی بە خۆشی کۆتایی دێت.
(٣) کردارو ڕەووشت و ووتەی وورووژێنەرو هەست بزوێن و بەجۆش.

**melodramatic** (mel′ə-drə-mat′ik), *adj.* (١) وەك میلۆدراما (ووشەی پێشوو ببینە). (٢) وورووژێنەر (کردار، ڕەووشت، ووتە)؛ بەجۆش؛ بەسۆزو توندوتیژ؛ هەست بزوێن.

**-melodramatically** *(adv.).*

**melodramatics** (mel′ə-drə-mat′iks), *n.pl.* (١) شانۆنامەی میلۆدراماتیکی (ووشەی پێشووتر ببینە). (٢) ڕەفتارو کردەوەی وورووژێنەرو هەست بزوێن و لە ئەندازە بەدەر بەجۆش.

**melody** (mel′ə-di), *n.* (١) ئاواز؛ ئەوا. (٢) ئاوازی خۆش یا شیرین.
(٣) خۆشی دەنگ؛ ئاوازی؛ مۆسیقایی: ***( the ~ of verse)*** .
(٤) هەڵبەستی گۆرانی.

**meloid** (mel′oid), *n.* جۆرێکە لە قالۆنچە.

***adj.*** قالۆنچەیی؛ تایبەتی بەم جۆرە قالۆنچەیە.

**melon** (mel′ən), *n.* (١) کاڵەك.
(٢) [Slang]، قازانجی چاوەڕوان نەکراو کە بەش دەکرێ لەنێوان بەشدارانی کۆمپانیایەکدا: ***( to cut a ~ )*** .

**melt** (melt), *v.i.* (١) (ا) توانەوە: ***( Sugar ~s in water.)*** .
(ب) چوونەوە (بەفر). (ج) یەقکردنەوە.
(٢) لەناوچوون؛ نەمان؛ توانەوە؛ سەرنگووم بوون:
***( Like snow in sunshine his capital had ~ed.)***
(٣) تێکەڵاوبوون؛ بوون بەیەك.
(٤) نەرم بوون (دڵ، هەست)؛ توانەوە:
***( Her heart ~ed at the child's tears.)***
(٥) [Obs.]، دڵشکست بوون؛ هەرەس بردن (مەجان)؛ ڕووخان (ترس، غەمباری، سەرسامی). (٦) تەڕاو لێ نیشتن؛ زۆر گەرمابوون.

***v.t.*** (١) ( ~ **down** )، تواندنەوە.
(٢) تواندنەوە: ***( ~ing honey in hot milk)*** .
(٣) وورده وورده نەهێشتن؛ پەرش و بڵاوەپێکردن؛ لەناوبردن:
***( The sun ~ed the fog.)***
(٤) تێکەڵاوکردن؛ تواندنەوە:
***( Here individuals of all races are ~ed into a new race of men.)***
(٥) تێکەڵاوکردن (ڕەنگ، دەنگ)؛ تێکەڵ کردن.
(٦) نەرم کردن (دڵ، هەست).

***n.*** (١) تواندنەوە؛ توانەوە. (٢) شتێکی توێنراوە؛ شتێکی تواوە.
(٣) ئەو هەندەی بە یەك جار دەتوێنرێتەوە یا دەتوێتەوە.

**meltage** (mel′tij), *n.* (١) تواندنەوە؛ توانەوە.
(٢) شتی توێنراوە یا تواوە، هەندی توێنراوە یا تواوە.

**melting point,** پلەی توانەوە.

**melting pot,** (١) دەفری تواندنەوەی کانزا.
(٢) وڵاتێکە کە هەموو جۆرە ئەتەوەیەکی کۆچەری تێدا کۆدەبێتەوەو تێکەڵاو دەبێت و دەتوێتەوە: ***( The United States is a ~ .)*** .

**member** (mem′bēr), *n.* (١) ئەندام (لەش)؛ پەل
(٢) بەش (هاوکێشەی ژمارەوپێوان، ڕستە، خانوو، پرد... هتد).
(٣) ئەندام (ڕێکخراو، یانە، حیزب).
(٤) [M-]، (ا) ئەندامی کۆنگرێسی ئەمەریکا.
(ب) ئەندامی پەرلەمانی ئینگلیزی

**membership** (mem′bēr-ship′), *n.* (١) ئەندامێتی؛ ئەندامی.
(٢) سەرجەمی ئەندامان (ڕێکخراو، یانە، حیزب):
***( The club has a large ~ .)***

**membranaceous** (mem′brə-nā′shəs), *adj.* = **membranous.**

**membrane** (mem′brān), *n.* پەردە (ڕووەك، گیاندار)؛ کاژ؛ تەنکە پێست.

**membranous** (mem′brə-nəs, mem-brā′nəs), *adj. Also* - **membranaceous,** (١) پەردەیی؛ لە پەردە دەچێ (گیاندار، ڕووەك)؛ لە پەردە پێکهاتوو. (٢) پەردە پێکهێنەر (نەخۆشی). (٣) زۆر تەنك.

**memento** (mi-men′tō), *n.* یادگار؛ نیشانە (بیرخستنەوە)؛ بیرخەرەوە.

**memento mori** (mi-men′tō mō′rī), [L.]. نیشانەی مردن (وەك کاسەی سەر)؛ بیرخەرەوەی مردن.

**memo** (mem′ō), *n.* [Colloq.], = **memorandum.**

**memoir** (mem′wär), *n.* (١) (ا) ژیاننامە؛ ژینامە. (ب) ژیاننامەی خۆ.
(٢) **memorandum** . (٣) ڕاپۆرتێکی زانستی؛ لێکۆڵینەوە.
(٤) (*pl.*)، یاداشت؛ بیرنامە؛ بیرەوەری: ***( m~s of a national leader)*** .
(٥) (*pl.*)، تۆمارنامەی کاروباری ڕێکخراوێکی زانستی.

**memorabilia** (mem′ēr-ə-bil′i-ə), *n.pl.* ئەو شتانەی شایانی لەبیربوونن؛ شتی لەیادنەچووەوە؛ شتی لەبیرنەچووەوە؛ شتی گرنگ.

**memorable** (mem′ēr-ə-b'l), *adj.* لەبیرنەچووەوە؛ خۆش؛ لەیادنەچووەوە: ***( We spent a ~ evening together.)*** .

-memorability *(n.)*; **memorablenss** *(n.)*; **memorably** *(adv.).*

**memorandum** (mem′ə-ran′dəm), *n.* (١) یادنامە؛ بیرنامە؛ ڕاگەیاندنامە: ***( He wrote a ~ to the department chairman.)***
(٢) تۆمارنامەی ڕێکەوتن یا قۆنتەراتێك.
(٣) یادنامەی دیبلۆماسی؛ ڕاگەیاندننامەی دیبلۆماسی.

**memorial** (mə-môr′i-əl, mə-mō′ri-əl), *adj.* (١) یادگاری؛ بیرخەرەوەیی: هی یادکردنەوە (٢) هی بیر؛ یادی؛ هی بیرەوەری.

*n.* (١) شتی بیرەوەری: شتێك کە بۆ بیرکردنەوەی کەسێك یا ڕووداوێك بکرێ یا کرابێ (پەیکەر، پشووی گشتی... هتد): ***( the Lincoln ~ in Washington)***

(٢) پرسە.

(٣) داوانامە؛ خو ڕنامە؛ سکالانامە

**Memorial Day,** ڕۆژی یادکردنەوەی کوژراوانی جەنگ لە ئەمەریکا (ڕۆژی ٣٠ ی مایس).

**memorialize** (mə-môr′i-ə-līz′, mə-mō′ri-ə-līz′), *v.t.* (١) یادکردنەوە؛ بیرەوەری کردنەوە. (٢) داوانامە پێشکەش کردن؛ خوازنامە یا سکالانامە پێدان

**memorization** (mem′ēr-i-zā′shən), *n.* لەبەرکردن؛ دەرخ کردن؛ ڕەوان کردن

**memorize** (mem′ə-rīz′), *v.t.* لەبەرکردن؛ ڕەوان کردن؛ دەرخ کردن

**memory** (mem′ēr-i), *n.* (١) بیر؛ یاد

***[ to have a good (or bad) ~ ]***

(٢) سەرجەمی شتی لەبیربوو. (٣) کەسێك، شتێك، یا کرداری لەیادبوو

(٤) بیرەوەری؛ ماوەی لەبیربوون؛ ماوەی لەیادبوون:

***( Not within the ~ of living men has this happened.)***

(٥) بەیادی؛ یاد: ***( in ~ of his father)*** .

(٦) ناوبانگی پاش مردن؛ ناوبانگی لە دوا بەجێماو:

***( a man of notorious ~ )***

(٧) ئەو بەشەی پێژمێری ئەلەکترۆنییە (کۆمپیوتەر) کە وەك مێشك یا بیری مرۆڤ زانیاری تێدا کۆدەکرێتەوەو دەپارێزرێ بۆ بەکارهێنانی لە پاشەڕۆژدا.

**commit to memory,** لەبەرکردن؛ ڕەوان کردن؛ دەرخ کردن:

***( to commit a poem to memory)***

**from memory,** لەبەر:

***( I can recite the poem from memory)***

**in memory of,** بەیادی: ***( in memory of the martyrs)*** .

**memsahib** (mem′sä′ib), *n.* میمساحب: نازناوی ئافرەتی ئەورووپایی مێردداره لە هیندستان (بەتایبەتی ژنی کاربەدەستێکی ئینگلیزی)

**men** (men), *n. plural of* man.

**menace** (men′is), *n.* (١) (ا) شتێکی مەترسی لێکراو؛ شتی ترسناك (ب) مەترسی. (٢) هەڕەشە.

(٣) کەسێکی ناپەسەندی ترسناك.

*v.t. & v.i.* (١) خستنە مەترسییەوە (٢) هەڕەشەلێکردن.

-menacingly *(adv.)*.

**ménage, menage** (mə-näzh′, mā-näzh′), *n.* (١) خێزان؛ ماڵ؛ خاوخێزان (٢) ماڵداری؛ بنەوانی ماڵ؛ کەیبانوویتی؛ ماڵ بەڕێوەبردن.

**menagerie** (mə-naj′ēr-i, mə-nazh′ēr-i), *n.* (١) کۆمەڵێك گیانداری کێوی یا سەیری ناو قەفەز بۆ نواندن.

(٢) پێشانگای کۆمەڵێك گیانداری کێوی یا سەیر.

**mend** (mend), *v.t.* (١) چاك کردنەوە؛ چاکردنەوە؛ چاك کردن:

***( to ~ shoes, a broken window, etc.)***

(٢) چاك کردن (ڕەووشت)؛ باشکردن؛ ڕاستکردنەوە:

***( M~ your manners.; to ~ one's ways)***

*v.i.* (١) ڕەووشت باش بوون؛ بەرەو باشی ڕۆیشتن.

(٢) چاکبوونەوە (تەندروستی): ***( The bone ~ed in a month.)*** .

*n.* (١) چاکبوونەوە؛ چاکبوون؛ چاکردنەوە؛ بەرەو باشی ڕۆیشتن.

(٢) شوێنی چاکراو؛ کونی دووراوە (جلوبەرگ)؛ جێی پینەکراو.

**mend a fire,** ئاگر خۆشکردن

**mend one's fences,** پەیوەندی باشکردن لەگەڵ دراوسێ و خەڵکی تردا (مرۆڤ، وڵات).

**mend one's pace,** پێ هەڵگرتن؛ خێراکردن؛ پەلەکردن.

**on the mend,** لە چاکبوونەوەدایە (تەندروستی)؛ بەرەو چاکبوونەوە دەچێ.

**mendacious** (men-dā′shəs), *adj.* (١) درۆزن: ***( a ~ child)*** . (٢) درۆ: ***( ~ statements, newspaper reports, etc.)*** .

**mendacity** (men-das′ə-ti), *n.* (١) درۆزنی؛ درۆزنێتی. (٢) درۆ.

**Mendel's laws,** یاساکانی مەندل (دەربارەی تایبەخۆی بە زگماکی بۆماوە لە گیاندارو ڕووەکدا).

**mendicancy** (men′di-kən-si), *n.* سواڵکەری؛ سواڵ کردن؛ دەست پانکردنەوە لە خەڵك.

**mendicant** (men′di-kənt), *adj.* بە سواڵکەری ژیاو؛ سواڵکەر.

*n.* (١) سواڵکەر. (٢) ووشکەسۆفی سواڵکەر (خاچ پەرستی).

**mendicity** (men-dis′ə-ti), *n.* = **mendicancy.**

**menial** (mē′ni-əl, mēn′yəl), *adj.* (١) هی نۆکەر؛ بۆ نۆکەر باشە (کار)؛ پیس و ناخۆش (کار): ***( a ~ job; She hated such ~ tasks as washing the pots and pans.)***

(٢) کاری پیس و ناخۆش و نۆکەریکەر.

*n.* (١) نۆکەر؛ بەردەست. (٢) کەسێکی پیسی بۆگەنی بێ نرخ.

**meningeal** (mə-nin′ji-əl), *adj.* تایبەتی بە پەردەی مێشك و مۆخی بڕبڕاگە.

**meninges** (mə-nin′jēz), *n.pl.* پەردەی مێشك و مۆخی بڕبڕاگە.

**meningitis** (men′in-jī′tis), *n.* هەوکردنی پەردەی مێشك و مۆخی بڕبڕاگە (پزیشکەوانی).

**meningococcus** (mə-niŋ′gō-kok′əs), *n.* میکرۆبی نەخۆشی پەردەی مێشك و بڕبڕە.

**meniscus** (mi-nis′kəs), *n.* (١) کەوانە؛ شتێکی کەوانەیی. (٢) گەردبینی قۆقزو قوپاو. (٣) ڕووی کەوانەیی شلەی ناو دەفر.

(٤) کرکراگەی جومگە (توێکاری).

**menology** (mi-nol′ə-ji), *n.* (١) ساڵنامەی ئاینی. (٢) کورتەی ژیاننامەی پیران لە ساڵنامەیەکی وەهادا.

**menopause** (men′ə-pôz′), *n.* وەستانی بێ نوێژی یا خوێن پژانی مانگانەی ئافرەت.

-menopausal *(adj.)*.

**menorrhagia** (men′ə-rā′ji-ə), *n.* بێ نوێژی یا خوێن پژانی لە ڕادە بەدەری مانگانەی ئافرەت.

**mensal** (men′s'l), *adj.* هی مێزی نانخواردن.

**mensal** (men′s'l), *adj.* مانگانە؛ مانگی؛ مانگی جارێك.

**menses** (men′sēz), *n.pl.* بێ نوێژی؛ خوێن پژانی مانگانەی ئافرەت.

**Menshevik, menshevik** (men′shə-vik′), *n.* مەنشەفیکی: ئەندامی لقی دابڕاو لە حیزبی دیموکراتی ئیشتراکی ڕووسی پێش شۆڕش کە بڕوای بە ڕێگەی شۆڕشگێڕانە نەبوو وە دژی " بۆلشەفیکەکان " وەستا.

-Menshevism *(n.)*; Menshevist *(n.)*.

**menstrual** (men′stroo-əl), *adj.* (١) هی بێ نوێژی؛ هی خوێن پژانی مانگانەی ئافرەت. (٢) مانگانە؛ مانگی جارێك ڕوودەدات؛ مانگێك دەخایەنێ.

**menstruate** (men′stroo-āt′), *v.i.* بێ نوێژی هاتن؛ خوێن پژان.

**menstruation** (men′′stroo-ā′shən), *n.* بێ نوێژی؛ خوێن پژانی مانگانەی ئافرەت.

**menstruous** (men′stroo-əs), *adj.* بێ نوێژ.

**mensurable** (men′shēr-ə-b'l), *adj.* دەپێورێ؛ ئەندازەی دەگیرێ.

**mensural** (men′shēr-əl), *adj.* پێوانەیی؛ پێوانی؛ هی پێوان.

**mensuration** (men′shə-rā′shən), *n.* (١) پێوان؛ ئەندازەگرتن. (٢) ئەندازەگرتنی قەوارەو پانی و درێژی و ڕوو (ژمارەوپێوان).

**-ment** (mənt, mint), پاشگرێکە بەمانای: (١) ئەنجام؛ بەرهەم: ***( improvement)***

(٢) هۆ.

(۳) کردن: شێوازی کردنی کارێك: ***(movement, measurement)*** .
(٤) بار؛ دۆخ ***(disappointment)*** .
**mental** (men′t'l), *adj.* (۱) مێشکی: هی مێشك؛ هۆشەکی:
***(~ powers)***
(۲) لە مێشکدا ئێکدەدرێتەوە (واتە بەبێ نووسینەوە): ***(~ arithmatic)*** .
(۳) شێت: مێشك تێکچوو: ***(a ~ patient)*** .
(٤) هی شێتان ***(a ~ hospital)*** .
**mental** (men′t'l), *adj.* چەناگەیی
**mental age,** تەمەنی مێشکی: ڕادەی تێگەیشتن و زیرەکی کەسێك.
**mental deficiency,** مێشك ناتەواوی (بە زگماکی).
**mentality** (men-tal′ə-ti), ***n.*** (۱) تواناى مێشکی؛ زیرەکی؛ مێشك.
(۲) باری مێشك: شێوەی بیرکردنەوە؛ بیروهۆش؛ شێوەی بیروهۆش:
***(a war ~ ; a racist ~ )***
**mentally** (men′t'l-i), *adv.* (۱) بە مێشك؛ لە مێشکدا.
(۲) لەڕووی مێشکەوە؛ دەربارەی مێشك؛ لەبارەی مێشکەوە.
**menthol** (men′thol, men′thōl, men′thôl), ***n.*** مێنسوڵ
ماددەیەکە لە نەعنا دەردەهێنرێ بۆ بۆن و دەرمان
**mention** (men′shən), ***n.*** ناوبردن؛ ناوبران؛ ناوهێنان.
***v.t.*** ناوبردن؛ ناوهێنان
**Don't mention it!** شایانی نییە! (لە وەڵامی سوپاسدا).
**make mention of,** ناوبردن؛ ناوهێنان
**not to mention,** جگەلە؛ بەخوازەلا.
**mentor** (men′tēr), ***n.*** ئامۆژگار؛ ڕابەری ژیری دڵسۆز؛
مامۆستای ئامۆژگاریکار.
**menu** (men′ū, mā′nū), ***n.*** (۱) لیستەی خواردن (چێشتخانە)؛
خۆراکنامە؛ ناشتامە (پێشی دەووتری " **bill of fare** ").
(۲) خواردن؛ خواردەمەنی پێشکەشکراو.
**meow, meou** (mi-ou′, myou), ***n.*** میاوانی پشیلە؛ میاومیاو.
***v.i.*** میاواندن
**Mephistopheles** (mef′ə-stof′ə-lēz′), ***n.*** (۱) مەفیستۆفیلیس:
شەیتانە گەورە (داستانی کۆن). (۲) شەیتان؛ کەسێکی زۆڵ و قومارباز.
**-Mephistophelean; Mephistophelian** ***(adj.).***
**mephitis** (me-fī′tis), ***n.*** (۱) بۆنێکی پیسی لە ژێرزەمینەوە هاتوو.
(۲) بۆگەن؛ بۆنێکی پیس.
**-mephitic** ***(adj.).***
**mercantile** (mũr′kən-til, mũr′kən-til′), ***adj.*** (۱) بازرگانی؛
هی بازرگانان و بازرگانی؛ بازاڕی. (۲) هی هەستی بازرگانێتی.
**mercantilism** (mũr′kən-til-iz'm), ***n.*** هەست و فەلسەفەی
بازرگانێتی (بەتایبەتی لە ئەوروپادا پاش دوایی پێ هاتنی دەرەبەگایەتی کە بریتی بوو لە پەرە پێ سەندنی بازرگانی و زیاترکردنی ناردنی شتومەك بۆ دەرەوە وەك لە هێنانی بۆ ناو وولات). (۲) بازرگانێتی.
**mercenary** (mũr′sə-ner′i), ***adj.*** (۱) (أ) تەنها بۆ پارە کراو؛
پارە خۆشەویست. (ب) چاوبرسی.
(۲) بە کرێ گیراو؛ هی سەربازی بە کرێ گیراو.
***n.*** (۱) سەربازی بە کرێ گیراو (لەلایەن وولاتی بێگانەوە)؛ جاش.
(۲) نۆکەر؛ چڵکاوخۆر؛ بە کرێ گیراو.
**mercer** (mũr′sēr), ***n.*** کووتاڵفرۆش؛ بازرگانی کووتاڵ.
**mercery** (mũr′sēr-i), ***n.*** (۱) کووتاڵ؛ قوماش
(۲) فرۆشگای کووتاڵ؛ کووتاڵ فرۆشی.
**merchandise** (mũr′chən-dīz′), ***n.*** (۱) فرۆتەنی؛ شتوومەکی
بازرگانی (۲) [Obs.]، بازرگانی؛ کڕین و فرۆشتن.
***v.t. & v.i.*** کڕین و فرۆشتن؛ بازرگانی کردن.
**merchant** (mũr′chənt), ***n.*** (۱) بازرگان؛ کۆفرۆش.
(۲) دووکاندار؛ وردەفرۆش؛ خاوەن فرۆشگا.
***adj.*** (۱) هی بازرگانی؛ بازرگانی. (۲) هی کەلەکەشتی بازرگانی.

**merchantman** (mũr′chənt-mən), ***n.*** (۱) کەشتی بازرگانی.
(۲) [Archaic]، بازرگان
**merchant marine,** (۱) کەلەکەشتی بازرگانی وولاتێك.
(۲) کەشتییەوانانی ئەم کەلەکەشتییە.
**merciful** (mũr′si-fəl), ***adj.*** بەبەزەیی؛ بەخشندە؛ دڵنەرم؛ بەڕەحم.
**merciless** (mũr′si-lis), ***adj.*** بێ بەزەیی؛ دڵڕەق؛ بێ ڕەحم؛
بێ ئامان.
**mercurate** (mũr′kyoo-rāt′), ***v.t.*** جیوە تێکەڵاوکردن؛
جیوە لێدان.
**mercurial** (mēr-kyoor′i-əl), ***adj.*** (۱) [M-]، تایبەتی بە
ئەستێرەی گەڕۆکی موشتەری. (۲) جیوەیی؛ جیوەدار.
(۳) زۆرزان؛ دانا؛ زیرەك و قومارباز.
(٤) هەمیشە گۆڕاو؛ حولحوڵی؛ جیوە تێکراو.
***n.*** دەرمانێك یا گیراوەیەکە کە جیوەی تێدابێ.
**mercurialism** (mēr-kyoor′i-əl-iz'm), ***n.*** ژەهر لێدران بە جیوە؛
ژەهراوی بوون بە جیوە.
**mercuric** (mēr-kyoor′ik), ***adj.*** جیوەداری هاوهێزی دوو
(کیمیاگەری).
**mercurous** (mēr-kyoor′əs, mũr′kyoo-rəs), ***adj.*** جیوەدار
(بەتایبەتی هی هاوهێزی یەك)
**Mercury** (mũr′kyoo-ri), ***n.*** (۱) خودای پەیامبەری و بازرگانی و
کارگەری و زمان پاراوی و زۆرزانی و هاتوچۆو دزی (ئەفسانەی ڕۆمانی)
(۲) ئەستێرەی گەڕۆکی موشتەری.
**mercury** (mũr′kyoo-ri), ***n.*** (۱) جیوە (۲) جیوەی گەرماپێو.
(۳) پەیامبەر؛ ڕابەر (٤) جۆرە ڕووەکێکی ئەوروپایییە هەندێکی دەخورێ و هەندێکی تریشی ژەهراوییە
**mercy** (mũr′si), ***n.*** (۱) بەزەیی؛ دڵنەرمی؛ ڕەحم
(۲) بەخشندەیی؛ لێبووردن. (۳) دەسەڵاتی بەخشین یا لێبووردن
(٤) خەڵاتی خواهانە.
***interj.*** وتەیەکە سەرسامی یا پەستی دەردەبڕێ وەك " ئەی هاوار بە ماڵم! "
**at the mercy of,** لەژێر دەسەڵات یا ڕەحمدا بوون:
***( A slave is at the mercy of his master.;***
***The ship was at the mercy of waves.)***
**mercy killing,** = **euthanasia.**
**mere** (mêr), ***adj.*** (۱) تەنها؛ هەر؛ هەر ئەوەندە. ***( He's a ~ child.)***
(۲) [Obs.]، تەواو؛ پەتی
**mere** (mêr), ***n.*** [Archaic, Poetic, or British Dial.], (۱) (أ) دەریا.
(ب) لقی دەریا. (۲) دەریاچە (۳) زەلکاو.
**mere** (mêr), ***n.*** [Archaic, Poetic, or British Dial.], سنوور.
**merely** (mêr′li), *adv.* (۱) تەنها؛ هەر؛ هەر ئەوەندە
***( I ~ asked you a question.)***
(۲) [Obs.]، بەتەواوی.
**meretricious** (mer′ə-trish′əs), ***adj.*** (۱) قەحبانە.
(۲) دووڕکوژ؛ درۆزنە؛ درۆ؛ بە ڕووکەش جوان؛ زەق و هەرزانبەها.
**merganser** (mēr-gan′sēr), ***n.*** جۆرە مراوییەکی ماسی خۆری
پۆپنەداری دەنووك باریك و نووشتاوەیە.
**merge** (mũrj), ***v.i. & v.t.*** لێکدان؛ بوون بە یەك؛ یەککگرتن؛
یەك گرتنەوە.
**-mergence** ***(n.).***
**merger** (mũr′jēr), ***n.*** بوون بە یەك (بەتایبەتی دوو کۆمپانیا یا زیاتر)؛
یەککگرتن.
**meridian** (mə-rid′i-ən), ***adj.*** (۱) هی نیوەڕۆ؛ نیوەڕۆ.
(۲) هی هێڵی درێژی (جوگرافیا).
(۳) تاف (گەنجی، جوانی، بەختیاری، دەسەڵات)؛ هەڕەت.
(٤) [Rare]، باشووری.

**n.** (١) بەرزترین شوێن کە ئەستێرەیەك پێیدا دەڕوات لە گەڕانیدا
(٢) تاف (گەنجی، جوانی، هێز، خۆشی، دەوڵەمەندی... هتد)؛ هەرەت.
(٣) [Obs.]، نیوەڕۆ. (٤) هێڵی نیوەڕۆ (ئەستێرەناسی).
(٥) هێڵی درێژی (جوگرافیا).
(٦) (ا) شوێنێکی تایبەتی. (ب) سرووشتی تایبەتی.

**meridional** (mə-rid'i-ə-n'l), ***adj.*** (١) باشووری
(٢) تایبەتی بە دانیشتووانی ناوچەی باشووری ئەورووپا بەتایبەتی فەرەنسا.
(٣) تایبەتی بە هێڵی نیوەڕۆ یا هێڵی درێژی.
**n.** [M-]. دانیشتووی ناوچەی باشووری ئەورووپا بەتایبەتی فەرەنسا

**meringue** (mə-raŋ'), ***n.*** (١) سپێنەی هێلکەی شلەقێنراوو شەکر کە لە فڕندا سوورەکرێتەوەو دەخرێتە سەر کێك. (٢) کێکێکە لەم سپێنەی هێلکەیەو شەکر دروست دەکرێت و میوە دەکرێتە ناویەوە.

**merino** (mə-rē'nō), ***n.*** (١) مەڕی ئیسپانی (کە بەرگنەکەی درێژو ئاوریشمییە). (٢) بەرگنی ئەم جۆرە مەڕە. (٣) ڕیسی ئەم خورییە.
(٤) قوماشێکی خورییە لەم خورییە دروست دەکرێت.
***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە مەڕو ڕیس و خوری و قوماشە.

**merit** (mer'it), ***n.*** (١) باشی، نایابی؛ چاکی؛ لێهاتوویی:
***( a play of ~ )***
(٢) (*pl.*) بەها؛ نرخ؛ بایەخ.
(٣) چاکە، کار یا شتی باش. (٤) خەڵات؛ پاداشت.
(٥) (*pl.*) چاك و خراپی؛ باش و خراپی:
***( You have to decide the case on its ~s.)***
***v.t.*** هێنان؛ شایستە بوون.

**merited** (mer'it-id), ***adj.*** دەهێنێ؛ شایستەی ئەوەیە.

**meritorious** (mer'ə-tôr'i-əs, mer'ə-tō'ri-əs), ***adj.*** باش؛ چاك؛ شایستەی خەڵاتە

**merit system,** سیستمی لێهاتوویی: دانان و پێشخستنی فەرمانبەران بەگوێرەی لێهاتوویی نەك خاترو خواییشت

**merl, merle** (mūrl), ***n.*** [Archaic or Poetic], باڵندەیەکی ڕەشی ئەورووپاییە نەختێك لە چۆلەکە گەورەترە

**merlin** (mūr'lin), ***n.*** باڵندەیەکی گۆشتخۆرە لە واشە دەچێ

**merlon** (mūr'lən), ***n.*** دیواری نێوان دوو کونی سەنگەرێك

**mermaid** (mūr'mād'), ***n.*** (١) پەری دەریا. گیاندارێکی ئەفسانەییە سەرو لەشی کچ و کلکی ماسی هەیە؛ کەنیشکی دەریا. (٢) ئافرەتی مەلەوان

**merman** (mūr'man'), ***n.*** (١) پیاوی ئاوی. گیاندارێکی ئەفسانەییە لەش و سەری پیاو و کلکی ماسی هەیە. (٢) پیاوی مەلەوان.

**-merous** (mēr-əs), پاشگرێکە بەمانای: ئەوەندە پارچە یا بەشی هەیە

**merrily** (mer'ə-li), ***adv.*** بەخۆشییەوە؛ بە کەیف و خۆشی؛ بەشادییەوە.

**merriment** (mer'i-mənt), ***n.*** خۆشی؛ شادی؛ زەماوەند؛ کەیف و خۆشی؛ بەزم و ڕەزم.

**merry** (mer'i), ***adj.*** (١) پڕ لە کەیف و خۆشی؛ پڕ لە شادی و پێکەنین؛ شاد؛ خۆش ***( a ~ laugh; a ~ Christmas)***
(٢) [Archaic] (ا) خۆش: ***( the ~ month of May)***
(ب) بەلاقرتێ؛ بەتەوسەوە.
**-merriness** ***(n.).***
**make merry,** بە پێکەنین و گۆرانی و زەماوەند کات ڕابواردن؛ خۆش ڕابواردن
**make merry over,** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.

**merry-andrew** (mer'i-an'drōō), ***n.*** قەشمەر؛ گاڵتەچی.

**merry-go-round** (mer'i-gō-round'), ***n.*** (١) چەرخ و فەلەك
(٢) ڕووداوی شت بەپەلەو یەك لەدوای یەك و سەیر؛ سوڕانەوە؛ خولانەوە

**merrymaker** (mer'i-māk'ēr), ***n.*** زەماوەندگێڕ؛ بەشداری ئاهەنگ، ئاهەنگکەر

**merrymaking** (mer'i-māk'iŋ), ***n.*** بەزم و ڕەزم؛ زەماوەند؛ ئاهەنگ.

**merrythought** (mer'i-thôt'), ***n.*** = wishbone.

**mesa** (mā'sə), ***n.*** گردێکی سەرتەخت و قەدپاڵ لێژ.

**mesalliance** (mā-zal'i-əns), ***n.*** ژنهێنان و شووکردنی ناهاوتا؛ ژنهێنان و شووکردن بە کەسێکی لە خۆ کەمتر.

**mescal** (mes-kal'), ***n.*** (١) جۆرێکە لە " کاکتەس " (ووشەی " cactus " ببینە). (٢) خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە لە خۆشاوی ئەم ڕووەکە دەردەهێنرێ.

**mescaline** (mes'kə-lēn', mes'kə-lin), ***n.*** مادەیەکی سڕکەر یا گێژکەرە وەك بەنگ دەبێتەهۆی هەلوەسەو زرەخەو ورێنە، لە ڕووەکی " مەسکەل " دەردەهێنرێ. (ووشەی پێشوو ببینە).

**mesdames** (mā-däm'), ***n.*** *plural of* **madame and madam.**

**mesdemoiselles** (mād'mwȧ'zel'), ***n.*** *plural of-* **mademoiselle.**

**meseems** (mē-sēmz'), ***impersonal v.*** [Archaic], وابزانم؛ لام وایە.

**mesencephalon** (mes'en-sef'ə-lon'), ***n.*** مێشکی ناوەڕاست.

**mesh** (mesh), ***n.*** (١) کون (تۆڕ، بێژنگ، هێلەك).
(٢) (*pl.*)، ڕایەڵەکانی کونە تۆڕ. (٣) تۆڕ. (٤) داو؛ تەڵە.
(٥) بەیەکداچوون و قایم بوونی ددانەکانی زنجیرو گێڕی مەکینە... هتد.
***v.t.*** (١) بە داوەوە کردن؛ پێوەکردن؛ ئاڵۆزاندن.
(٢) بەیەکداکردن و لەیەك قایم کردنی ددانەکانی زنجیرو گێڕی مەکینە... هتد.
(٣) پێکەوە گونجان؛ پێکەوە باش کارکردن.
***v.i.*** (١) ئاڵۆزان؛ پێوەبوون. (٢) بەیەکداچوون و قایم بوونی ددانەکانی زنجیرو گێڕی مەکینە... هتد. (٣) پێکەوە گونجان؛ شیان.
**in mesh,** بەیەکداچووەو قایم بووە (ددانەکانی زنجیرو گێڕی مەکینە)؛ لەیەك گیربوون.

**meshwork** (mesh'wūrk'), ***n.*** تۆڕ؛ تەیمانە.

**meshy** (mesh'i), ***adj.*** کون کون وەك تۆڕ.

**mesial** (mē'zi-əl, mes'i-əl), ***adj.*** لە ناوەڕاستدا: بەتایبەتی بە دووبەشکردنی لەشی گیاندار بە هێ ڕاست و چەپەوە.

**mesmeric** (mes-mer'ik, mez-mer'ik), ***adj.*** خەولێخەر (وەك بە نووانی موگناتیسی)؛ دڵفڕێنەر؛ هۆش لێبر.

**mesmerism** (mes'mēr-iz'm, mez'mēr-iz'm), ***n.*** (١) خەولێخستنی موگناتیسی؛ نووانی موگناتیسی؛ هۆش لێ بڕین. (٢) دڵفڕاندن

**mesmerize** (mes'mə-rīz', mez'mə-rīz'), ***v.t.*** (١) نووانی موگناتیسی؛ خەولێخستنی موگناتیسی؛ هۆش لێ بڕین.
(٢) دڵفڕاندن؛ شێت و شەیداکردن:
***( He could ~ an audience by the sheer force of his presence.)***
**-mesmerizer** ***(n.).***

**mesne** (mēn), ***adj.*** ناوەڕاست (کات).

**mesne lord,** دەرەبەگێکە کە زەوی بە کرێ دەگرێ لە دەرەبەگێکی گەورەتر لە خۆی.

**meso-** (mes'ō, mes'ə), پێشگرێکە بەمانای: لەنێوان؛ نێوان؛ ناوەڕاست؛ ناوەند.

**mesoblast** (mes'ə-blast'), ***n.*** ئەو شانانەی ناوڵەمەیە کە سەرچاوەی پەرەسەندنی ئێسقان و ماسولکەو تێشووی لەشە.

**mesocarp** (mes'ə-kärp'), ***n.*** ناوەڕۆکی گۆشتی میوە.

**mesocephalon** (mes'ō-sef'ə-lon'), ***n.*** = **mesencephalon.**

**mesoderm** (mes'ə-dūrm'), ***n.*** = **mesoblast.**

**mesomorphic** (mes'ə-môr'fik), ***adj.*** (١) هی باری نێوان شلەو ڕەقی. (٢) هی لەشی ماسولکەی بەهێزو ئێسقانداوی.

**mesonephros** (mes'ə-nef'ros), ***n.*** گورچیلەی ناوڵەمەی گیانداری بڕبڕەدار.

**mesophyll** (mes′ə-fil′), *n.* شانەی نەرمی ناوەوەی گەڵا.
**mesophyte** (mes′ə-fīt′), *n.* ڕووەکێکە لە دەوروبەرێکدا دەڕوێت
کە شێی مام ناوەندی بێت.
**Mesopotamia** (mes′ə-pə-tā′mi-ə), *n.* مێزۆپۆتامیا: وڵاتی
نێوان دوو ڕووبار. " عێراق ".
**mesquite, mesquit** (mes-kēt′, mes′kēt), *n.* دار یا دەوەنێکی
دڕکاوی‌یە بەرەکەی وەك كەڵووی پاقلە وایە.
**mess** (mes), *n.* (١) ژەم؛ یەك خۆراك. (٢) ژەمە شۆربا.
(٣) خواردنی ناخۆش.
(٤) تاقمێك كە هەمیشە پێكەوە نان دەخۆن (وەك سەربازان؛ ئارەڵی سەر خوان.
(٥) (ا) ئەو ژەمە خواردنەی ئەم تاقمە پێكەوە دەیخۆن.
(ب) خوان: خوانی گشتی یا كۆمەڵ؛ خوانی جەماوەری: *( He's at ~ now.)*.
(٦) كۆمەڵێك شتی تێكەڵاوپێكەڵاو یا بەسەریەكدا كەوتوو.
(٧) تەنگوچەڵەمە: ناخۆشی؛ سەرئێشە: *( He got himself into a ~ .)*.
(٨) تێكەڵاوپێكەڵاوی؛ پیس‌وپۆخڵی.
(٩) گەندوگوو؛ پیسی؛ پیسایی: *( Please clean up this ~ .)*.
*v.t.* (١) خواردن پێدان (وەك لە سوپادا).
(٢) (ا) پیس كردن؛ پیس‌وپۆخڵ كردن. (ب) ( ~ **up** )، تێكدان:
*( The late arrival of the train ~ed up our plans.)*
(٣) [Obs. or Dial.]، خواردن بەشكردن؛ خواردن بەخشینەوە.
*v.i.* (١) نانخواردن بە جەماوەری؛ پێكەوە نانخواردن.
(٢) تێكدان: تێكەڵاوپێكەڵاوكردن؛ شێواندن.
(٣) دەست تێكێشان؛ دەست تێخستن (كاروباری خەڵك).
**make a mess of,** تێكدان؛ شێواندن.
*( He made a mess of his life.)*
**mess around ( or about ),** (١) خۆ خەریك كردن؛ كات كوشتن؛
خۆ خڵەفاندن بە شتی هیچ‌وپووچ و بێ ئەنجامەوە:
*( She's always messing around the house.)*
(٢) [Colloq.]، ناپاكی كردن لە ژن و مێردی خۆ (بەتایبەتی بەدزی‌یەوە).
**message** (mes′ij), *n.* (١) نامە؛ پەیام؛ ڕاسپاردە.
(٢) پەیامبەری. (٣) پەیامێكی گرنگ (وەك هی پێغەمبەرێك یا فەیلەسووفێك).
**messenger** (mes′'n-jēr), *n.* (١) پەیامبەر؛ نامەبەر؛ تەتەر.
(٢) ڕابەر؛ پێغەمبەر. (٣) [Archaic]، پێشەنگ؛ مژدەبەر.
**mess hall,** ژوور یا هۆڵی نانخواردن (ئۆردوگا)؛ خوانی جەماوەری.
**Messiah** (mə-sī′ə), *n.* (١) ڕزگاركەری چاوەڕوانكراوی جوولەكە
(ئاینی جوولەكە). (٢) مەسیح؛ عیسا.
(٣) [m-]، ڕزگاركەری چاوەڕوانكراو.
**Messianic** (mes′i-an′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە مەسیح؛ هی عیسا.
(٢) [m-]. هی ڕزگاركەری چاوەڕوانكراو.
**Messias** (mə-sī′əs), *n.* = **Messiah.**
**messieurs** (mes′ērz), *n. plural of* **monsieur.**
**messily** (mes′ə-li), *adv.* بە پیس‌وپۆخڵی؛ بە تێكەڵاوپێكەڵاوی؛
بە شێواوی؛ بە پیسی.
**messiness** (mes′i-nis), *n.* پیس‌وپۆخڵی؛ پیسی؛ شێواوی؛
تێكەڵاوپێكەڵاوی
**mess jacket,** چاكەتی سپی پیاوانەی تەسكی كورت هەتا ناوقەد
(بۆ بۆنەی ڕەسمی).
**mess kit,** دەفری نانخواردنی سەربازو دەشتەوان.
(پێشی دەووترێ: " **mess gear** ").
**messmate** (mes′māt′), *n.* هاوخوان (ئۆردوگا).
**Messrs.** (mes′ērz), *n. plural of* **Mr.**
**messuage** (mes′wij), *n.* خانووبەرە؛ماڵێك بە خانوو خانوچكەو
حەوشەو زەوی دەوروبەری‌یەوە.
**messy** (mes′i), *adj.* (١) پیس‌وپۆخڵ؛ پیس؛ ناپوختە؛ تێكەڵ‌وپێكەڵ؛
ناڕێك‌وپێك؛ شێواو *( a ~ place, dress, person, etc.)*.

(٢) خراپ (باری ژیان)؛ پڕ لە سەرئێشە؛ ناخۆش؛ شێواو: *( a ~ situation)*
**mestiza** (mes-tē′zə), *n.* كەسێكی دووڕەگ (بەتایبەتی ئافرەتێك كە
نەوەی ئیسپانی یا پورتوگالی و هیندی ئەمەریكی بێت لە وڵاتانی ئەمەریكای
لاتینیدا).
**mestizo** (mes-tē′zō), *n.* كەسێكی دووڕەگ (بەتایبەتی پیاوێك یا
كوڕێك كە نەوەی ئیسپانی یا پورتوگالی و هیندی ئەمەریكی بێت لە وڵاتانی
ئەمەریكای لاتینیدا).
**met** (met), *past tense and past participle of* **meet.**
**meta-** (met′ə), پێشگرێكە بەمانای: (١) شێوە گۆڕان:
*( metamorphosis)*
(٢) (ا) لەولا؛ لەوپەڕ؛ لەپاش؛ ئەودیو: *( metaphysics)*.
(ب) بەرزتر؛ لەسەر (٣) لەپشتەوە؛ لەپشت.
(٤) لێوە وەرگیراو (كیمیا).
**metabolic** (met′ə-bol′ik), *adj.* تایبەتی بە كردارە كیمیایی‌یەكان
لە لەشی گیانداردا (ووشەی داهاتوو ببینە).
**metabolism** (mə-tab′ə-liz′m), *n.* مێتابۆلیزم: كردارەكانی
زیندەوەری؛ كردارە كیمیایی‌یەكانی شانەكانی زیندەوەر كە پێویستە بۆ ژیان؛
زیندەكار.
**metabolite** (mə-tab′ə-līt′), *n.* ماددەیەك كە لە ئەنجامی كردارە
كیمیایی‌یەكانی شانەكانی زیندەوەردا پەیدا دەبێت.
**metabolize** (mə-tab′ə-līz′), *v.t. & v.i.* گۆڕینی خواردەمەنی بە
كردارە كیمیایی‌یەكانی شانەكانی زیندەوەر بۆ بەردەوام بوونی ژیان
**metacarpus** (met′ə-kär′pəs), *n.* ئێسقانەكانی دەست لەنێوان
مەچەك و پەنجەكاندا؛ شانەی لەپ؛ بەروپشتی لەپ.
-metacarpal *(adj.)*.
**metacenter, metacentre** (met′ə-sen′tēr), *n.* چەقی
قورسایی بەشی نوقووم بووی لەشێكی سەرئاوكەوتوو.
**metagalaxy** (met′ə-gal′ək-si), *n.* گەردوون.
**metal** (met′'l), *n.* (١) كان؛ كانزا. (٢) داڕێژراوێكی دوو كانزا یا زیاتر.
(٣) شتێكی كانزایی. (٤) سرووشتی مرۆڤ؛ ماك؛ گەوهەر.
(٥) [British]، بەردەشكاو؛ وردە بەرد.
(٦) شووشەی تواوە (كە پەیكەرو شتی شووشەی لێ درووست دەكرێ).
(٧) ئاسنی جۆشدراوی تواوە. (٨) تیپی كانزایی (چاپەمەنی).
*adj.* كانزایی؛ لە كانزا درووستكراو.
*v.t.* بە كانزا داپۆشین؛ كانزا لێدان.
**metalist, metallist** (met′'l-ist), *n.* (١) كارگەری كانزا.
(٢) لایەنگری بەكارهێنانی پارەی كانزایی لەباتی هی كاغەز.
**metalize** (met′'l-īz′), *v.t.* (١) داپۆشین بە كانزا؛ كانزا لێدان.
(٢) گۆڕین بۆ كانزا
**metallic** (mə-tal′ik), *adj.* (١) كانزایی.
(٢) كانزای تێدایە؛ كانزای لێ دەردێت؛ لە كانزا پێكهاتوو:
*( a ~ compound)*
(٣) لە هی كانزا دەچێ (دەنگ): *( a ~ sound)*.
-metallically *(adv.)*.
**metalliferous** (met′'l-if′ēr-əs), *adj.* كانزای لێ دەردێت؛
كانزادار.
**metalline** (met′'l-in, met′'l-in′), *adj.* (١) **metallic**.
(٢) كانزا یا ئایۆنی كانزایی تێدایە.
**metalist** (met′'l-ist), *n.* = **metalist.**
**metallize** (met′'l-īz′), *v.t.* = **metalize.**
**metallography** (met′'l-og′rə-fi), *n.* (١) لێكۆڵینەوەی پێكهاتن و
تایبەخۆی كانزاو داڕێژەی كانزایی. (٢) جۆرێكە لە چاپكردن.
**metalloid** (met′'l-oid′), *n.* (١) شتی ناكانزایی.
(٢) شتی نیمچە كانزایی.
*adj.* (١) لە كانزاچوو. (٢) ناكانزایی؛ نیمچە كانزایی

**metallurgist** (met′'l-ũr′jist), *n.* کانزاناس؛ زانای کانزا؛ کارگەری کانزا.

**metallurgy** (met′'l-ũr′ji), *n.* (١) کانزاناسی؛ زانستی کانزا؛ کانزاکاری. (٢) پاك و پوختەکردنی کانزا؛ پاکردنەوەی کانزای خاو و جیاکردنەوەی کانزا پوختەکەی.

**-metallurgic; metallurgical** *(adj.).*

**metalwork** (met′'l-wũrk′), *n.* (١) ئامێر و دەفر و شتی تری کانزایی. (٢) کانزاکاری؛ دروستکردنی شت لە کانزا.

**metalworking** (met′'l-wũr′kiŋ), *n.* دروستکردنی شت لە کانزا؛ کانزاکاری.

**metamorphic** (met′ə-môr′fik), *adj.* (١) تایبەتی بە گۆڕینی شێوە و سرووشتی شت. (٢) تایبەتی بە گۆڕینی بەردێك بۆ بەردێکی تر (زەمیناسی

**metamorphism** (met′ə-môr′fiz'm), *n.* (١) شێوە گۆڕان (جانەوەر)؛ گۆڕان (زیندەوەرزانی). (٢) گۆڕانی بەردێك بۆ بەردێکی تر بەهۆی گەرما و پەستان و کرداری کیمیایی‌یەوە.

**metamorphose** (met′ə-môr′fōz, met′ə-môr′fōs), *v.t.* گۆڕین؛ شێوە گۆڕین (زیندەوەرزانی).

**metamorphosis** (met′ə-môr′fə-sis, met′ə-môr-fō′sis), *n.* (١) (ا) گۆڕانی تەواوی شێوە و سرووشت و گەوهەر (بە جادووگەری). (ب) شێوەی پەیدابوو لە ئەنجامی ئەم گۆڕینەدا (٢) گۆڕانی تەواوی ڕووخسار و سرووشت و بار (٣) گۆڕانی شێوە و پێکهاتن و ئەرك (زیندەوەرزانی)، بەتایبەتی: (ا) گۆڕانی یەکجار و کوتوپڕی لەش (وەك سەرمێکوتە بۆ بۆق). (ب) گۆڕانی ڕووەك. (ج) گۆڕانی شانەی لەش.

**metanephros** (met′ə-nef′ros), *n.* گورچیلەی ئاوئەمە

**metaphor** (met′ə-fẽr, met′ə-fôr′), *n.* بڕیتیکاری (زمان. وێژە)؛ بریکاری؛ مەجاز: *( a heart of stone; the evening of life; He was a lion in the battle.)*

**-metaphoric** *(adj.).*

**mix metaphors,** دوو ووتەی مەجازی نەگونجاو یا زیاتر: *" Young man, you have a spark in you-water it!"*

**metaphorical** (met′ə-fôr′i-k'l, met′ə-for′i-k'l), *adj.* هی ووتەی مەجازی؛ مەجازی

**-metaphorically** *(adv.).*

**metaphrase** (met′ə-frāz′), *n.* گۆڕینی دەقاودەق (زمانەوانی)؛ گۆڕینی ووشە بە ووشە.

*v.t.* (١) گۆڕینی دەقاودەق، واتە، ووشە بە ووشە. (٢) دەستکاری کردنی دەقی نووسراوێك بەتایبەتی لەلایەن ناحەزانەوە بە جۆرێك کە بە ئاسانی هەستی پێ نەکرێ (بۆ گۆڕینی ماناکەی بۆ مەبەستی خۆ).

**metaphrast** (met′ə-frast′), *n.* ئەو کەسەی نووسراوێکی وێژەیی لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر دەگۆڕێ (وەك لە پەخشانەوە بۆ هۆنراوە)

**metaphysic** (met′ə-fiz′ik), *n.* (١) metaphysics. (٢) [Obs.] metaphysician.

*adj.* [Rare], = metaphysical.

**metaphysical** (met′ə-fiz′i-k'l), *adj.* (١) میتافیزیکی (ووشەی دواتر ببینە) (٢) لێڵ (زانیاری)؛ نادیار؛ ڕووت. (٣) لە سرووشت بەدەر؛ لەولای سرووشتەوە؛ لەودیو سرووشتەوە. (٤) شارەزای زانیاری و فەلسەفەی لە سرووشت بەدەر. (٥) تایبەتی بە دەستەیەك هۆنەری ئینگلیزی سەدەی حەڤدە (کە هۆنراوەکانیان بە لێڵی و لە سرووشت بەدەر ناسراوە).

**-metaphysically** *(adv.).*

**metaphysician** (met′ə-fə-zish′ən), *n.* زانای زانست و فەلسەفەی لە سرووشت بەدەر.

**metaphysics** (met′ə-fiz′iks), *n.pl.* (١) میتافیزیك؛ زانیاری لە سرووشت بەدەر؛ زانیاری ئەودیو سرووشت؛ زانیاری و فەلسەفەی بوونەوەری و سەرچاوە و سرووشتی جیهان. (٢) تیۆری و فەلسەفەی زانیاری‌یەکی تایبەتی. (٣) لێکدانەوەی لێڵ و نادیار و سەرسووڕمێن.

**metaplasm** (met′ə-plaz'm), *n.* (١) بەشی مردووی پرۆتۆپلازمی شانەی زیندەوەر. (٢) جێگۆڕکێ پێکردن، زیادکردن، یا لابردنی تیپ یا بڕگە لە ووشەیەك.

**metaprotein** (met′ə-prō′tēn), *n.* لە کردنی ترشەلۆك یا قلیە بەسەر پرۆتیندا پەیدا دەبێت (ماددە).

**metapsychology** (met′ə-sī-kol′ə-ji), *n.* لێکدانەوەی فەلسەفی دەربارەی سەرچاوە و پێکهاتنی مێشك و پەیوەندی بە جیهانەوە هەر وەك دێتە بەرچاو.

**metasomatism** (met′ə-sō′mə-tiz'm), *n.* گۆڕانی کیمیایی بەردێك یا کانزایەك بۆ بەردێك یا کانزایەکی تر. (هەروەها " metasomatosis ").

**metastasis** (mə-tas′tə-sis), *n.* (١) [Rare]، گۆڕینی تەواو (شێوە، سرووشت). (٢) metabolism. (٣) پەڕین یا بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە ئەندامێکەوە بۆ ئەندامێکی تر (شێرپەنجە). (٤) بازدان لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر (ڕەوانبێژی).

**metastasize** (mə-tas′tə-sīz′), *v.i.* بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە ئەندامێکی لەشەوە بۆ ئەندامێکی تر.

**metatarsus** (met′ə-tär′səs), *n.* شانەی پێ؛ ناوەڕاستی پێ بەتایبەتی ئێسقانەکانی پەنجەی پێ لەنێوان قولەپێ و پەنجەکاندا.

**metathesis** (mə-tath′ə-sis), *n.* (١) جێگۆڕکێ پێکردنی دوو تیپ، دەنگ، یا بڕگە بەبێ گۆڕینی مانای ووشەکە (ڕوانین). (٢) جێگۆڕکێ کردنی گەرد (کیمیا).

**-metathetic** *(adj.)*; **metathetically** *(adv.).*

**metathorax** (met′ə-thôr′aks, met′ə-thō′raks), *n.* دوایەمین بەشی سنگی جانەوەر.

**Metazoa** (met′ə-zō′ə), *n.pl.* گیانداری زۆر شانەدار.

**metazoan** (met′ə-zō′ən), *adj.* زۆر شانەدار (گیاندار).

**mete** (mēt), *v.t.* (١) ( ~ out )، دابەشکردن؛ پێدان؛ بۆ دانان: *( to ~ out rewards)* (٢) [Archaic or Poetic]، پێوان.

**mete** (mēt), *n.* سنوور.

**metempsychosis** (met′əm-sī-kō′sis), *n.* گواستنەوەی گیانی گیانەوەرێك لەکاتی مردندا بۆ ناو گیانەوەرێکی زیندوو.

**meteor** (mē′ti-ẽr), *n.* (١) ئەستێرەی کشاو. (٢) دیاردەی کەش (وەك تەرزە، پەلکەزێڕینە... هتد).

**meteoric** (mē′ti-ôr′ik, mē′ti-or′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە دیاردەی کەش: *( Hail is a ~ phenomenon.)*. (٢) هی ئەستێرەی کشاو. (٣) وەك ئەستێرەی کشاوە لە بریقە و ڕووناکی و خێراییدا.

**meteorite** (mē′ti-ẽr-īt′), *n.* (١) بەردی ئەستێرەی کشاو کە دەکەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی. (٢) ئەستێرەی کشاو.

**meteorograph** (mē′ti-ôr′-ə-gräf′), *n.* ئامێری پێوەری دیاردەی کەش.

**meteoroid** (mē′ti-ẽr-oid′), *n.* ئەستێرەی کشاو.

**meteorologic** (mē′ti-ẽr-ə-loj′ik, mē′ti-ôr′ə-loj′ik), *adj.* *Also* **meteorological,** کەش؛ تایبەتی بە دیاردەی کەش.

**-meteorologically** *(adv.).*

**meteorologist** (mē′ti-ə-rol′ə-jist), *n.* زانای دیاردەی کەش؛ کەشناس.

**meteorology** (mē′ti-ə-rol′ə-ji), *n.* زانستی دیاردەی کەش؛ کەشناسی؛ ئاووهەواناسی.

**meter, metre** (mē′tẽr), *n.* (١) کێش (هۆنراوە).

(۲) کێشی مۆسیقا. (۳) مەتر.

**meter** (mē′tẽr), *n.* پێوەر: کات، دووری، خێرایی، هەند، توندوتیژی؛ ژمێرەر: ***( a water- ~ ; a parking ~ )*** .

***v.t.*** پێوان بە پێوەر: ژماردن بە ژمێرەر.

**-meter** (mē′tẽr, mi-tẽr), پاشگرێکە بەمانای: (۱) پێوەر؛ ژمێرەر: ***( barometer, thermometer)***

(۲) (ا) ژمارە مەترێکی تایبەتی: ***( kilometer)*** .

(ب) کەرتەمەترێکی تایبەتی؛ ژمارەیەکی تایبەتی لە کەرتەمەتر: ***( centimeter)***

(۳) کێشێکی تایبەتیدار (هۆنراوە): ***( pentameter)*** .

**methadon** (meth′ə-don′), *n.* مێسادۆن دەرمانێکی سڕکەرە.

**methane** (meth′ān), *n.* مێسان: گازێکی بسووتی بێ ڕەنگی بێ بۆنی کانگەو زۆنگە (کیمیا).

**methanol** (meth′ə-nōl′, meth′ə-nol′), *n.* مێسانۆل شلەیەکی بسووتی بێ ڕەنگی ژەهراوییە (کیمیا).

**methinks** (mi-thiŋks′), ***impersonal v.***, [Archaic], لام وایە؛ وا بزانم.

**method** (meth′əd), *n.* (۱) شێوەی کردنی کارێك؛ شێواز؛ ڕێباز؛ ڕێگە: ***( modern ~s of language teaching)*** .

(۲) ڕێك‌وپێکی (بیروڕا، کار، دەربڕین، شتومەك ڕێکخستن).

**methodic** (mə-thod′ik), *adj.* = methodical.

**methodical** (mə-thod′i-k'l), *adj.* ڕێك‌وپێك؛ بە شێوازێکی تایبەتی کراو یا ڕێکخراو: ***( ~ work; a ~ man)*** .

**methodically** (mə-thod′i-k'l-i), *adv.* بەپێی شێوازێکی تایبەتی؛ بەووردی؛ بە ڕێك‌وپێکی: ***( to arrange or do something ~ )***

**Methodism** (meth′əd-iz'm), *n.* (۱) بیروڕا و شێوەی پەرستنی لقێکی کلێسەی خاچ پەرستەکانە کە پێیان دەڵێن " مێسۆدی‌یەکان " . (ووشەی دوایی ببینە). (۲) خۆبەستنەوە بە توندوتیژی بە شێوازێکی تایبەتی لە کردنی کارێکدا.

**Methodist** (meth′əd-ist), *n.* (۱) ئەندامی لقێکی کلێسەی خاچ پەرستەکان کە پێی دەووترێ " مێسۆدی‌یەکان " وە لەلایەن چارلس‌و جۆن وێسلی‌و چەند کەسێکی ترەوە لە ئۆکسفۆرد لە ئینگلتەرە لە ساڵی ۱۷۲۹ دا دامەزرا.

(۲) [m-] .[Rare]، کەسێکە کە بە توندوتیژی خۆی دەبەستێتەوە بە شێوازێکی تایبەتی‌یەوە لە کردنی کارێکدا.

**methodize** (meth′ə-dīz′), *v.t.* ڕێك‌وپێك کردن؛ شێوازێکی تایبەتی بۆ دانان.

**methodology** (meth′ə-dol′ə-ji), *n.* (۱) زانستی شێوازی بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەی زانیاری‌و فەلسەفی (ژیربێژی). (۲) زانستی شێوازی کردنی کارێك؛ سەرجەمی شێوازی لێکۆڵینەوەی زانیاری‌یەك یا کردنی شتێك.

**methought** (mi-thôt′), [Archaic], *past tense of* methinks.

**Methuselah** (mə-thū′z'l-ə), *n.* (۱) کەنەپیاوێکی جوولەکەیە کە بەپێی ئینجیل گوایە (۹٦۹) ساڵ ژیاوە. (۲) پیاوێکی زۆر پیر.

**meticulous** (mə-tik′yoo-ləs), *adj.* (۱) زۆر وورد (مرۆڤ)؛ وورد؛ پوختە. (۲) زۆر سەرنجدەر بە شتی ووردو بێ بایەخ.

-meticulousity; meticulousness *(n.)*; meticulously *(adv.)*.

**métier** (mā-tyā′), *n.* پیشە

**métif** (mā-tēf′), *n.* کەسێکی دووڕەگ (بەتایبەتی کە هی فەرەنسی‌و هیندی ئەمەریکایی بێت).

**metonym** (met′ə-nim), *n.* ووشەی مەجازی (ووشەی دوایی ببینە).

**metonymy** (mə-ton′ə-mi), *n.* مەجاز: بەکارهێنانی ووشە یا دەستەواژەیەك بە مانای ووشە یا دەستەواژەیەکی تر: ***( the White House decided = the President decided; the Crown = the King or the Queen)***

-metonymic; metonymical *(adj.)*.

**metre** (mē′tẽr), *n.* = meter.

**metric** (met′rik), *adj.* (۱) تایبەتی بە پێوان. (۲) مەتری؛ تایبەتی بە پێوانی مەتری: ***( ~ system)*** .

**metrical** (met′ri-k'l), *adj.* (۱) کێشدار (هۆنراوە). (۲) metric .

-metrically *(adv.)*.

**metrics** (met′riks), *n.pl.* (۱) لێکۆڵینەوەی کێشی هۆنراوە. (۲) نووسینی هۆنراوەی کێشدار. (۳) تیۆری پێوان (ژمارەوپێوان).

**metric system,** پەیرەوی مەتری؛ پەیرەوی پێوان‌و کێشانی دەیی بەگوێرەی مەترو کیلۆگرام.

**metric ton,** تەنی مەتری؛ تەنی هەزار کیلۆیی.

**metrist** (met′rist, mē′trist), *n.* (۱) هۆنەری هۆنراوەی کێشدار؛ هۆنەر. (۲) زانای کێشی هۆنراوە؛ پسپۆری هۆنراوەی کێشدار.

**metritis** (mi-trī′tis), *n.* ئاوسانی منداڵدان.

**Metro, metro** (mē′trō), *n.* میترۆ: ڕێگەی شەمەندەفەری کارەبایی ژێرزەمین.

**metro-** (mē′trō, met′rə), پێشگرێکە بەمانای: پێوان: ***( metrology)***

**metro-** (me′trō, met′rə), پێشگرێکە بەمانای: منداڵدان.

**metrology** (mi-trol′ə-ji), *n.* (۱) زانستی کێشان‌و پێوان؛ کێشان‌و پێوان زانی. (۲) پەیرەوی کێشان‌و پێوان.

**metronome** (met′rə-nōm′), *n.* ئامێرێکی کات ژماردنە.

**metronymic** (mē′trə-nim′ik, met′rə-nim′ik), *adj.* ناوی دایکی یا داپیرییە؛ لە ناوی دایکی یا داپیری‌یەوە وەرگیراوە.

**metropolis** (mə-trop′'l-is), *n.* (۱) گەورە شاری وولاتێك؛ پایتەخت؛ شاری سەرەکی وولاتێك. (۲) شارێکی گەورە؛ شارێکی سەرەکی. (۳) دایکەشاری ناوچەیەکی یۆنانی کۆن. (٤) سەرەك قەشەنشین.

**metropolitan** (met′rə-pol′ə-t'n), *adj.* (۱) پایتەختی؛ گەورەشاری؛ سەرەك شاری. (۲) سەرەك قەشەنشینی.

*n.* (۱) شاری؛ شارستانی؛ خەڵکی شار؛ دانیشتووی شار. (۲) سەرەك قەشە (۳) هاووڵاتی دایکەشاری ناوچەیەکی یۆنانی کۆن.

**-metry** (met′ri), پاشگرێکە بەمانای: پێوان؛ زانستی پێوان؛ هونەری پێوان.

**mettle** (met′'l), *n.* ڕەووشت بەرزی؛ ڕەووشت؛ نازایی؛ غیرەت؛ نەبەردی؛ جۆش؛ چالاکی: ***( to test someone's ~ )*** .

**on one's mettle,** پاڵ پێوەنراو بۆ هەوڵدان بە ئەوپەڕی توانا.

**mettled** (met′'ld), *adj.* = mettlesome.

**mettlesome** (met′'l-səm), *adj.* بەغیرەت؛ بەجۆش؛ نازا؛ چالاك.

**mew** (mū), *n.* (۱) قەفەزی هەڵۆ. (۲) لانە؛ جێی خۆشاردنەوە. (۳) [Obs.]، جێی بەستنەوە؛ بەندیخانە.

*v.t.* (۱) ( ~ up )، خستنە قەفەزەوە؛ بەستنەوە. (۲) (ا) [Archaic]، پەڕ فڕێدان. (ب) [Obs.]، شاخ کەوتن یا فڕێدان (کەڵەکێوی).

*v.i.* [Archaic], پەڕ فڕێدان؛ پەڕ کەوتن (باڵندە).

**mew** (mū), *n.* میاومیاوی پشیلە؛ میاوان

*v.i.* میاوان؛ میاواندن.

**mew** (mū), *n.* ئەورەس؛ باڵندەیەکی ئاوی سپی یا بۆرە ئەختێك لە کۆتر گەورەترە.

**mewl** (mūl), *v.i.* گریان وەك منداڵ؛ نووزەنووزکردن.

**mews** (mūz), *n.pl.* (۱) تاوڵەی ئەسپی شاهانەی لەندەن. (۲) تاوڵەی دەوری حەوشەیەك یا لارێیەك (کە ئێستا زۆربەیان کراون بە خانووچکە)

**Mexican** (mek′si-kən), *adj.* مەکسیکی؛ تایبەتی بە گەل مەکسیك‌و زمان‌و کلتوورەکەیان.

*n.* کەسێکی مەکسیکی؛ هاوولاتییەکی مەکسیك.

**mezzanine** (mez′ə-nēn′, mez′ə-nin), *n.* (١) نیمچە نهۆمی نێوان نهۆمی یەکەم و دووەمی خانوویەك.
(٢) (ا) نزمترین بالکۆنی سینەما، شانۆ، یا تیاترۆخانە.
(ب) ریزە کورسییەکانی پێشەوەی ئەم بالکۆنە.

**miaow, miaou** (mi-ou′, myou), *n. & v.i.* = **meow; mew.**

**miasma** (mī-az′mə, mi-az′mə), *n.* هالاوی بۆگەنی لە زۆنگاو و لاشەی بۆگەن کردووەوە هاتوو

**-miasmal** *(adj.)*; **miasmatic; miasmic** *(adj.)*.

**mica** (mī′kə), *n.* میکا: کانزایەکی فافۆنی یا سلیکۆنییە بە ئاسانی دەکرێ بە تەبەقی تەنك و گەرما کاری تێ ناکات.

**mice** (mīs), *n. plural of* **mouse.**

**mickle** (mik′'l), *adj. & adv. Also* muckle. [Archaic or-Scot.], زۆر؛ گەلێك؛ بڕێکی زۆر

**micro-** (mī′krō, mī′krə), پێشگرێکە بەمانای: (١) (ا) بچووك.
(ب) زۆر بچووك. (٢) گەورەکەر: *(microscope, microphone)*.
(٣) ملیۆن یەکی پێوانەیەکی تایبەتی: *(microgram)*.

**microbarograph** (mī′krō-bar′ə-graf′), *n.* ئامێری پێوانی گۆڕینی زۆر کەم لە پەستاوتنی هەوادا.

**microbe** (mī′krōb), *n.* میکرۆب؛ خۆرە.

**-microbial** *(adj.)*.

**microbic** (mī-krō′bik, mī-krob′ik), *adj.* میکرۆبی؛ خۆرەیی.

**microbicide** (mī-krō′bə-sīd′), *n.* میکرۆب کوژ؛ خۆرەکوژە.

**microbiology** (mī′krō-bī-ol′ə-ji), *n.* زانستی زیندەوەری گەردبینی.

**microcephaly** (mī′krə-sef′ə-li), *n.* سەربچووکی؛ مێشك بچووکی.

**-microcephalic** *(adj. & n.)*; **microcephalous** *(adj.)*.

**microchemistry** (mī′krō-kem′is-tri), *n.* کیمیایی شت و هەندی گەردبینی

**microclimate** (mī′krō-klī′mət), *n.* ئاووهەوای ناوچەیەکی زۆر بچووك.

**-microclimatology** *(n.)*.

**microcopy** (mī′krō-kə′pi), *n.* وێنەی دەقاودەقی زۆر بچووك.

**microcosm** (mī′krə-koz'm), *n.* جیهانی بچووك، بەتایبەتی.
(ا) مرۆڤ وەك وێنەیەکی زۆر بچووکی هەموو جیهان.
(ب) دێیەك یا کۆمەڵگایەك وەك وێنەیەکی بچووکی هەموو جیهان.

**-microcosmic; microcosmical** *(adj.)*.

**microcyte** (mī′krə-sīt′), *n.* خڕۆکەی سووری زۆر بچووك (له نەخۆشی کەم خوێنیدا دەبینرێ)

**microfilm** (mī′krə-film′), *n.* فیلمێکی زۆر بچووکە وێنەی پەرتووك و بڕوانامەو شتی تری لەسەر دەگیرێت و کە ویستڕا بە ئامێری شەوق هاوێژ دەخوێنرێتەوە.

**microgram, microgramme** (mī′krə-gram′), *n.* ملیۆن یەکی گرامێك.

**micrograph** (mī′krə-graf′, mī′krə-gräf′), *n.* (١) ئامێری نووسین و وێنەکاری و شت هەڵکەندنی زۆر بچووك
(٢) وێنەی شتێك بەو شێوەیەی کە بە گەردبین دەبینرێ.
(٣) ئامێری تۆمارکردن و پێوانی جوولەی زۆر بچووك

**-micrography** *(n.)*.

**microgroove** (mī′krə-grōōv′), *n.* (١) هێڵی زۆر باریکی قەوان کە بەهۆیەوە قەوانەکە زیاتر شتی لەسەر تۆمار دەکرێ. (٢) قەوانێکی وەها

**micrology** (mī-krol′ə-ji), *n.* لێکۆڵینەوەی شتی هیچ وپووچ

**micrometeorite** (mī′krə-mē′ti-ēr-īt′), *n.* ئەستێرەیەکی کشاوی زۆر بچووك (بەتایبەتی کە بگاتە سەر زەوی بێ ئەوەی بسووتێ)

**micrometer** (mī-krom′ə-tēr), *n.* ئامێرێکە بۆ پێوانی دووری زۆر کەم و گۆشەی زۆر بچووك لەگەڵ گەردبین و دووربیندا بەکاردێت.

**micrometry** (mī-krom′ə-tri), *n.* پێوان بە مایکرۆمەتر (ووشەی پێشوو ببینە).

**micron, mikron** (mī-kron), *n.* مایکرۆن: ملیۆن یەکی مەترێك.

**microorganism** (mī′krō-ôr′gən-iz'm), *n.* زیندەوەری گەردبین.

**microphone** (mī′krə-fōn′), *n.* مایکرۆفۆن: ئامێری دەنگ گەیاندن و گەورەکردن.

**microphotograph** (mī′krə-fō′tə-graf′, mī′krə-fō′tə-gräf′), *n.* (١) وێنەیەکی زۆر بچکۆلە. (٢) وێنەیەکی گەردبینی؛ وێنەیەکە کە لەڕێی گەردبینەوە گیرابێ.

**microphyte** (mī′krə-fīt′), *n.* ڕووەکی گەردبینی (بەتایبەت لاخۆن).

**microprint** (mī′krə-print′), *n.* وێنەیەکی ئەوەندە بچووکە کە بە ئامێری گەورەکەر نەبێ نابینرێ.

**micropyle** (mī′krə-pīl′), *n.* (١) کونیلە (لە نێرکی ڕووەکدا بۆ چوونە ناوەوەی تۆو یا هەڵاڵە). (٢) کونیلە (لە پەردەی هێلکەدانی زیندەوەردا بۆ چوونە ناوەوەی تۆماو).

**microscope** (mī′krə-skōp′), *n.* گەردبین؛ زەڕەبین؛ میکرۆسکۆب.

**microscopic** (mī′krə-skop′ik), *adj.* (١) گەردبینی؛ زۆر بچووك؛ ئەوەندە بچووکە بە گەردبین نابینرێ. (٢) زۆر بچووك؛ زۆر وورد.
(٣) تایبەتی بە گەردبین.
(٤) زۆر بەووردی کراو؛ زۆر وورد: *(a ~ investigation)*.
(٥) ووردبین؛ وەك گەردبین وایە لە بینینی شتی زۆر ووردا.

**-microscopical** *(adj.)*; **microscopically** *(adv.)*.

**microscopy** (mī-kros′kə-pi, mī′krə-skō′pi), *n.* لێکۆڵینەوە بە گەردبین؛ لێکۆڵینەوەی گەردبینی.

**microseism** (mī′krə-sīz'm, mī′krə-sīs'm), *n.* بوومەلەرزەیەکی زۆر بچووك.

**microsome** (mī′krə-sōm′), *n.* دەنکۆڵەی زۆر بچووکی ناو پرۆتۆپلازمای شانەی زیندەوەر و ڕووەك.

**microspore** (mī′krə-spôr′, mī′krə-spōr′), *n.* شانەی بچووکی زاووزێی ڕووەك و زیندەوەری گەردبینی کە خۆی دەبێتە ڕووەك و زیندەوەری گەردبینی.

**microtome** (mī′krə-tōm′), *n.* ئامێری توێ توێ کردنی تێشوو بۆ لێکۆڵینەوەی بە گەردبین.

**microtomy** (mī-krot′ə-mi), *n.* توێ توێ کردنی تێشوو بۆ لێکۆڵینەوەی بە گەردبین.

**microwave** (mī′krə-wāv′), *n.* مایکرۆویڤ؛ شەپۆلی زۆر کورتی ئەلەکترۆموگناتیسی.

**micturate** (mik′choo-rāt′), *v.i.* میزکردن.

**micturition** (mik′choo-rish′ən), *n.* (١) میزکردن.
(٢) زۆر میزکردن؛ زوو زوو میزکردن

**mid** (mid), *adj.* (١) ناوەڕاست؛ هی ناوەڕاست.
(٢) دەبێژرێ کە زمان لە ناوەڕاستی ئاسمانە و زەمینەی دەمدا بێت وەك لە هەندێ تیپە بزوێندا (وەك: " a " لە " cake " وە " o " لە " cold " دا).

**mid-** (mid), پێشگرێکە بەمانای: ناوەڕاست؛ بەشی ناوەڕاست: *(midbrain, mid-Atlantic)*

**midbrain** (mid′brān′), *n.* بەشی ناوەڕاستی مێشك.

**midday** (mid′dā′), *n.* نیوەڕۆ.
*adj.* نیوەڕۆ؛ هی نیوەڕۆ.

**midden** (mid′'n), *n.* (١) [British Dial.]، سەرەنوێڵك.
(٢) گردۆڵکەیەکە کە ئێسقان و پاشماوەی تری کۆمەڵگایەکی سەرەتایی تێدابێ. (پێشی دەووترێ: " kitchen midden ").

**middle** (mid′'l), *adj.* (١) ناوەڕاست. (٢) ناوەند؛ ناوەندی.

(۳) ناوچەق؛ چەق. (٤) [M-]، قۆناغی نێوان کۆن و تازە لە گۆڕانی زمانێکدا؛ هی سەردەمی ناوەڕاست: *(M~ English)*.
*n.* (۱) ناوەڕاست. (۲) ناوەندی؛ شتی ناوەندی. (۳) ناوقەد؛ کەمەر.
*v.t. & v.i.* (۱) خستنە ناوەڕاستەوە. (۲) دوولۆکردن (پەت، گوریس).
**middle age,** تەمەنی نێوان گەنجی و پیری.
**middle-aged** (mid′'l-ājd′), *adj.* نە گەنج و نە پیر؛ هی تەمەنی نێوان گەنجی و پیری؛ هی بەساڵداچوو.
**Middle Ages,** سەدانی ناوەڕاست (لە مێژووی ئەوروپادا لە ساڵی: ٥٠٠–١٤٥٠ ی زایینی).
**middle-class** (mid′'l-klas′, mid′'l-kläs′), *adj.* هی چینی ناوەندی کۆمەڵ؛ بورجوازی.
**middle class,** چینی ناوەندی کۆمەڵ؛ چینی بورجوازی؛ بورجوازی.
**middle ear,** گوێی ناوەڕاست؛ پەردەی گوێ.
**middlebrow** (mid′'l-brō′), *n.* [Colloq.], خوێندەواری مام ناوەندی؛ نیمچە خوێندەوار؛ کەم خوێندەوار؛ ڕۆشنبیری مام ناوەندی.
**Middle East,** ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.
**Middle English,** ئینگلیزی ناوەندی: زمانی ئینگلیزی لە سەدەی دوانزەهەمی زایینییەوە هەتا کۆتایی سەدەی پانزەهەم.
**middleman** (mid′'l-man′), *n.* (۱) دەڵاڵ کەسێکە کە شتومەك لە خاوەنەکەی دەکڕێت و دەیفرۆشێتەوە بە وردەفرۆش یا خۆی دەیفرۆشێتەوە. (۲) ناوبژێکەر.
**middlemost** (mid′'l-mōst′), *adj.* = **midmost.**
**middle-sized** (mid′'l-sīzd′), *adj.* ناوەندی (قەوارە).
**middleweight** (mid′'l-wāt′), *n.* (۱) کەسێکی سەنگ مام ناوەندی. (۲) بۆکسباز یا زۆرانبازێك کە قورسایی ۱٤۸–۱٦۰ پاوەن بێت.
**middling** (mid′liŋ), *adj.* ناونجی (قەوارە، بار، دۆخ، چۆنێتی)؛ ئاسایی *(fair to ~)*.
*adv.* ئەختێك؛ تا ڕادەیەك؛ بە ڕادەیەکی مام ناوەندی.
*n.* (۱) گۆشتی نێوان ڕان و ملی بەراز.
(۲) (*pl.*). شتومەکی مام ناوەندی (باش و خراپی، قەوارە، نرخ).
**midge** (mij), *n.* (۱) مێشوولەی بچووك؛ جانەوەرێکی بچووکی وەك مێشوولە. (۲) **midget**.
**midget** (mij′it), *n.* (۱) کورتەباڵا؛ جرج؛ فیرنەگولە.
(۲) شتێکی بچووك لەچاو توخمەکەی خۆیدا.
*adj.* بچووك؛ بچووك لەچاو توخمی خۆدا.
**midland** (mid′lənd), *n.* (۱) ناوچەی ناوەڕاستی وڵات؛ ناوچەی ناوەوەی وڵات. (۲) [M-]، شێوەزمانی ئینگلیزی ناوچەکانی ناوەڕاستی ئینگلتەرە (کە بناغەی ئینگلیزی ئەمڕۆیە).
*adj.* (۱) هی ناوەڕاستی وڵات؛ هی ناوچەی ناوەوەی وڵات.
(۲) [M-]. تایبەتی بە ناوچەی ناوەڕاستی ئینگلتەرە.
**midmost** (mid′mōst′), *adj.* ناوەڕاست؛ ناوچەق؛ ناوەڕاستی تەواو.
*adv.* لە ناوەڕاستدا؛ لە ناوچەقدا؛ بەتەواوی لە ناوەڕاستدا.
*prep.* لە ناوەڕاستیدا؛ لە ناوچەقیدا.
**midnight** (mid′nīt′), *n.* (۱) نیوەشەو. (۲) شەوەزەنگ؛ زۆر تاریك.
*adj.* (۱) نیوەشەوی؛ بە نیوەشەو؛ نیوەشەو.
(۲) زۆر تاریك؛ ڕەش: *(~ blue)*.
**burn the midnight oil,** سەعی کردن یا کارکردن تا نیوەشەو.
**midnight sun,** خۆری نیوەشەو کە لە نیوەشەوی هاویندا لە تەوەری باکوور و باشووردا دەبینرێ.
**midnoon** (mid′nōōn′), *n.* [Rare], = **noon.**
**midrib** (mid′rib′), *n.* دەماری ناوەڕاستی گەڵا (لە قنچکەکەیەوە تا سەرەکەی).
**midriff** (mid′rif), *n.* (۱) ناوپەنچك (توێکاری)؛ پەردەی ماسولکەیی نێوان بۆشایی سنگ و بۆشایی سك. (۲) ناوەڕاستی لەشی مرۆڤ لەنێوان ناوقەد و سنگدا. (۳) (ا) ئەو بەشەی جلی ئافرەت کە ئەم ناوەڕاستەی لەشی دادەپۆشێ. (ب) ئەو بەشەی جلی ئافرەت کە ئەم ناوەڕاستەی لەشی دەردەخات.
*adj.* تایبەتی بەو جلەی ئافرەت کە ناوچەی نێوان ناوقەد و سینەی دەردەخات.
**midship** (mid′ship′), *adj.* هی ناوەڕاستی کەشتی.
**midshipman** (mid′ship′mən), *n.* (۱) قوتابی دانشگای هێزی دەریایی ئەمەریکی. (۲) ئەفسەرێکی بچووکی هێزی دەریایی ئینگلیزی.
**midst** (midst, mitst), *n.* ناوەڕاست؛ ناو؛ ناوجەرگە.
**in our ( or your, their ) midst,** لە ناوماندا (یا لە ناوتاندا، یا لە ناویاندا).
**in the midst of,** (۱) لە ناوەڕاستی؛ لە ناوەندی؛ لە ناوجەرگەی.
(۲) لە کاتی.
**midsummer** (mid′sum′ẽr), *n.* (۱) ناوەڕاستی هاوین.
(۲) کاتی ڕۆژ گەڕانەوەی هاوین.
**midterm** (mid′tũrm′), *adj.* هی ناوەڕاستی وەرز.
*n.* [Colloq.], تاقیکردنەوەی ناوەڕاستی وەرزی زانکۆ.
**midway** (mid′wā′), *n.* (۱) (ا) نیوەڕێ؛ نیوەی ڕێ؛ ناوەڕاستی دوو شوێن. (ب) میانڕەوی؛ نێوانڕۆیی (بیروباوەڕ، هەڵوێست، کردار).
(۲) ناوچەی نوواندن و ڕابواردن و تیاترۆی پیشانگەیەك یا کەرنەڤاڵێك.
*adj. & adv.* نیوەڕێ؛ لە نیوەی ڕێدا.
**midweek** (mid′wēk′), *n.* ناوەڕاستی هەفتە.
*adj.* لە ناوەڕاستی هەفتەدا؛ هی ناوەڕاستی هەفتە.
-midweekly *(adv.)*.
**Midwest** (mid′west′), *n.* ڕۆژاوای ناوەڕاستی ئەمەریکا (کە ناوچەکانی ناوەڕاستی ئەمەریکا دەگرێتەوە).
-Midwestern *(adj.)*; Midwesterner *(n.)*.
**midwife** (mid′wīf′), *n.* مامان.
**midwifery** (mid′wīf′ẽr-i, mid′wīf′ri), *n.* مامانی؛ مامانێتی.
**midwinter** (mid′win′tẽr), *n.* (۱) ناوەڕاستی زستان
(۲) کاتی ڕۆژ گەڕانەوەی زستان.
**midyear** (mid′yêr′), *adj.* لە ناوەڕاستی ساڵدا؛ هی ناوەڕاستی ساڵ.
*n.pl.* [Colloq.], تاقیکردنەوەی ناوەڕاستی ساڵی زانکۆ.
**mien** (mēn), *n.* (۱) ڕەفتار؛ ڕەووشت؛ چۆنێتی هەڵسان و دانیشتن: *(a person of noble ~)*
(۲) ڕووالەت؛ ڕووخسار؛ دیمەن؛ ڕوو.
**miff** (mif), *n.* [Colloq.], دەمەقاڵێ؛ شەڕێکی بچووك؛ پێکاهاتن.
*v.t. & v.i.* [Colloq.], پەست بوون؛ لێ پەست بوون؛ لێ زوویربوون: *(to be ~ed at somebody)*
**might** (mīt), *v. past tense of* **may.**
**might** (mīt), *n.* هێزی زۆر؛ دەسەڵاتی گەورە؛ توانا؛ زەبروزەنگ: *(the military ~ of the United States)*
**with might and main,** بەوپەڕی تواناوە؛ بە هەموو هێزێکییەوە.
**mightily** (mīt′'l-i), *adv.* (۱) بە هێزەوە؛ بە هێز و تواناوە.
(۲) زۆر؛ تا ڕادەیەکی زۆر؛ ئێجگار: *(to be ~ indignant)*.
**mighty** (mīt′i), *adj.* (۱) بەهێز؛ زۆر بەهێز: *(the ~ ocean)*.
(۲) توند؛ توندوتیژ: *(a ~ blow of his ax)*.
(۳) زۆر زل؛ زۆر گەورە: *(a ~ hill)*.
*adv.* [Colloq.], زۆر؛ ئێجگار زۆر: *(~ hard)*.
-mightiness *(n.)*.
**migraine** (mī′grān, mi-grān′), *n.* سەرئێشەیەکی ناوبەناوە تووشی لایەکی سەر دەبێت، گەلێك جار سەرەخولێ و دڵ تێکهەڵهاتنی لەگەڵە.
**migrant** (mī′grənt), *adj.* کۆچەر؛ ڕەوەند.
*n.* مرۆڤ، باڵندە، یا زیندەوەری کۆچەر.
**migrate** (mī′grāt), *v.i.* (۱) کۆچ کردن؛ وڵاتی خۆ بەجێهێشتن و جێنشین بوون لە وڵاتێکی تر. (۲) هەوار گواستنەوە (باڵندە، زیندەوەر، مرۆڤ)؛ گەرمیان و کوێستان کردن؛ بارکردن؛ کۆچ کردن؛ ڕەوکردن.
**migration** (mī-grā′shən), *n.* (۱) کۆچ کردن؛ کۆچ؛ گەرمیان و

کوێستان کردن (٢) کۆمەڵێك مرۆڤ، باڵندە، یا زیندەوەری پێکەوە کۆچکەر.
(٣) (ا) جێگۆڕکێ کردنی گەرد (کیمیا).
(ب) کۆبوونەوەی ئایۆنات لە جەمسەری ئەلەکتریکیدا (کیمیا).

**migratory** (mī′grə-tôr′i, mī′grə-tō′ri), *adj.* (١) کۆچەر: پەوەند؛ گەرمیان و کوێستان کەر: *( ~ birds)* .
(٢) هی کۆچ کردن: هی کۆچەری.
(٣) کۆچەر: گەڕۆك.

**mikado** (mi-kä′dō), *n.* میکادۆ: نازناوی شاهەنشای یابانە.

**mike** (mīk), *n.* [Slang], = **microphone.**

**mikron** (mī′kron), *n.* = **micron.**

**mil** (mil), *n.* (١) هەزاریەکی گرێیەك (بۆ پێوانی تیرەی تەل بەکاردێت)
(٢) میلیمەتر
(٣) پێوانەیەکی گۆشەیە.

**milady, miladi** (mi-lā′di), *n.* (١) خانمەکەم: خانم: نازناوی ژنە بەگزادەی ئینگلیزە (لە دووان لەگەڵیدا یا دەربارەیەوە بەکاردەهێنرێ).
(٢) ئافرەتێکی تەڕپۆش.

**milage** (mīl′ij), *n.* = **mileage.**

**milch** (milch), *adj.* شیردەر؛ شیردار: *( ~ cows)* .

**mild** (mīld), *adj.* (١) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ هێواش:
*( a ~ nature; ~ manners)*
(٢) ناوەندی؛ کەم: *( a ~ punishment)* .
(٣) سووك؛ کز: *( a ~ fever, cold, etc.)* .
(٤) توون و تیژ نییە: *( a ~ cheese, cigar, etc.)* .
(٥) فێنك؛ نە گەرم و نە سارد؛ سازگار: *( ~ weather)* .
(٦) نەرم (پۆڵا، ئاسن)؛ گونجاو: بەرگەگر: *( ~ steel)* .

**mildew** (mil′dōō′, mil′dū′), *n.* کەڕوو.
*v.i.* کەڕوو هەڵهێنان.

**mildewy** (mil′dōō′i, mil′dū′i), *adj.* (١) کەڕوو هەڵهێناو؛ کەڕووناوی. (٢) وەك کەڕوو وایە؛ لە کەڕوو دەچێ.

**mildly** (mīld′li), *adv.* (١) لەسەرخۆ؛ بە هێمنی؛ بە هێواشی.
(٢) نەختێك؛ تۆزێك؛ تا ڕادەیەك

**to put it mildly,** هەر هیچ نەبێ؛ بێ ئەوەی هیچی پێوە بنێیت.

**mile** (mīl), *n.* میل: پێوانەیەکە بریتییە لە ١٧٦٠ یاردە، یا ٢٥.١٦٠٩ مەتر، یا ٥٢٨٠ پێ. (پێشی دەووترێ: " **statute mile** ") .

**mileage, milage** (mīl′ij), *n.* (١) بۆ بژاردنی پارەی گەشتێك بەپێی دووری (٢) سەرجەمی دووری بە میل؛ ماوە بە میل.
(٣) سەرجەمی میلی بڕراو لە ماوەیەکی تایبەتیدا.
(٤) [Colloq.]، کەڵك؛ سەرجەمی کەڵکی وەرگیراو لە شتێك:
*( to get full ~ out of a typewriter)*

**milepost** (mīl′pōst′), *n.* نیشانەی پیشاندەری دووری شوێنێك بە میل؛ ستوونی دووری پیشاندەر بە میل.

**milestone** (mīl′stōn′), *n.* (١) بەرد، ستوون، یا نیشانەی پیشاندەری دووری شوێنێك بە میل. (٢) ڕووداوێکی زۆر گرنگ لە ژیانی کەسێکدا یا مێژووی گەلێك یا شتێکدا.

**miliaria** (mil′i-âr′i-ə), *n.* نەخۆشییەکی پێستە لە داگیرسانی لووی تەڕاوەوە پەیدا دەبێ و نیشانەکانی سووربوونەوەی پێست و تلۆق و خووروو تووزانەوەیە

**milieu** (mēl-yoo′), *n.* دەوروبەر (بەتایبەتی هی کۆمەڵایەتی)؛ شوێنەوار: دەوروپشت: *( a person's ~ )* .

**militancy** (mil′i-tən-si), *n.* جەنگاوەری: خەباتکاری؛ توندوتیژی لە مەودای ڕامیاری و نەتەوەپەرستی و ماف داواکردندا.

**militant** (mil′i-tənt), *adj.* جەنگاوەر؛ خەباتکەر؛ توندوتیژ (بەتایبەتی لە مەودای ڕامیاری و نەتەوەپەرستی و ماف داواکردندا).
*n.* کەسێکی جەنگاوەر، خەباتکەرێك؛ کەسێکی توندوتیژ لە کاروباری ڕامیاری و نەتەوە و ئاین پەرستی و ماف داواکردندا

**militarily** (mil′ə-ter′ə-li), *adv.* (١) لەڕێی سوپاوە؛ بە سوپا.
(٢) لەڕووی سوپاوە.

**militarism** (mil′i-tə-riz′m), *n.* (١) سوپاپەرستی؛ گیانی سوپاپەرستی؛ هەڵوێستی سوپاپەرستی و شەڕپەرستی.
(٢) بەدەسەڵاتی سوپا لە کاروباری فەرمانڕەواییدا.
(٣) جەنگاوەری و دڕی و ڕاگرتنی سوپایەکی بەهێز بۆ جەنگاندن.

**militarist** (mil′i-tə-rist), *n.* (١) سوپاپەرست؛ کەسێکی جەنگاوەر و سوپاپەرست. (٢) زانای جەنگ و زانستی سوپایی.
-**militaristic** *(adj.)*; **militaristically** *(adv.)*.

**militarize** (mil′i-tə-rīz′), *v.t.* (١) سوپا بەهێزکردن؛ سوپا بەهێز کردن و خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ.
(٢) بڵاوکردنەوەی گیانی سوپاپەرستی لە وڵاتدا.
-**militarization** *(n.)*.

**military** (mil′ə-ter′i), *adj.* (١) سوپایی؛ تایبەتی بە سوپا؛ تایبەتی بە لەشکر یا هێزی چەکدار.
(٢) جەنگی؛ تایبەتی بە جەنگ؛ بۆ جەنگ شیاو.
*n.* ( the ~ ), سوپا؛ لەشکر:
*( The ~ took control of the government.)*

**military intelligence,** سووسەی سوپایی.

**military law,** یاسای سوپایی.

**military police,** پۆلیسی سوپایی؛ باڵبازی سوپایی.

**militate** (mil′i-tāt′), *v.i.* (١) سەربازی کردن؛ شەڕکردن؛ جەنگان.
(٢) دژکاری کردن؛ دژ وەستان؛ دژبوون: *( His youth ~d against him.)* .

**militia** (mə-lish′ə), *n.* هێزی میللی؛ میلیشیا.

**militiaman** (mə-lish′ə-mən), *n.* سەربازی هێزی میللی؛ سەربازی میلیشیا.

**milk** (milk), *n.* (١) شیر.
(٢) شیرە (وەك هی گوێزی هیندی، هەنجیر...هتد)؛ شیلە.
*v.t.* (١) دۆشین: *( to ~ a cow, goat, sheep)* .
(٢) لێ سەندن (پارە، بیروباوەڕ، هێز... هتد)؛ ڕووتکردنەوە (مەجاز):
*( corrupt officials ~ing the company for all they could)*
(٣) لێ دەرهێنان (ژەهر؛ شیلە): *( He ~ed the snake of its venom.)* .
(٤) لێ دەرهێنان (دەنگوباس): *( to ~ information from a person)* .
*v.i.* شیردان: *( The cows are ~ing well now.)* .

**cry over spilt milk,** خەفەت خواردن بۆ شتی ڕابوردوو و لەدەستچوو.

**milk adder,** = **milk snake.**

**milk-and-water** (milk′ən-wô′tēr, milk′ən-wät′ēr), *adj.* بوودەڵە؛ لاواز؛ هیچ‌ڕیووچ؛ بێ دەسەڵات؛ ڕاڕا.

**milker** (mil′kēr), *n.* (١) دۆشەر؛ مەڕومالات دۆش.
(٢) مەکینەی شیردۆش؛ مەکینەی مانگادۆش.
(٣) مانگای شیر؛ شیردەر (مانگا، مەڕ، بزن): *( a good ~ )* .

**milk fever,** (١) تای مەمك پێدان (کە تووشی ئافرەت دەبێ پاش منداڵبوون و شیر دان). (٢) تایەکی وەهایە تووشی مانگا دەبێ پاش زاین.

**milkfish** (milk′fish′), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریاییە.

**milk leg,** هەوکردنی لاقی ژن پاش منداڵبوون.

**milk-livered** (milk′liv′ērd), *adj.* ترسنۆك؛ بێ غیرەت؛ کوونی.

**milkmaid** (milk′mād′), *n.* کچە شیردۆش؛ ئافرەتی شیردۆش.

**milkman** (milk′man′), *n.* شیرفرۆش.

**milk of human kindness,** هەستی هاوسۆزی و بەزەیی و دڵفراوانی و دڵنەرمی مرۆڤ.

**milk of magnesia,** دەرمانێکی سك ڕەوانی و دژترشییە.

**milk shake,** خواردنەوەیەکە لە شیر و دۆندرمە و داودەرمانی تام و بۆنخۆش درووست دەکرێ.

**milk snake,** جۆرە مارێکی بچووکی بێ ژەهرە. (پێشی دەووترێ: " **house snake** " وە " **milk adder** ") .

**milksop** (milk′sop′), *n.* ژنانی: کچانی؛ پیاو یا کوڕی سەرژنانی؛ بوودەڵە
**milk sugar,** شەکری شیر.
**milk tooth,** ددانی منداڵی (پێشی دەوترێ: " baby tooth ").
**milkwhite** (milk′hwīt′), *adj.* سپی وەك شیر
**milky** (mil′ki), *adj.* (١) شیری؛ سپی وەك شیر.
(٢) شیردار؛ شیردەر؛ شیری تێدایە. (٣) ترسنۆك؛ سەرشۆڕ.
**Milky Way,** خەتی کاکێشان (ئەستێرەوانی).
**mill** (mil), *n.* (١) ئاش (٢) مەکینەی هاڕینی دانەوێڵە؛ دەستاڕ.
(٣) هاڕەر: مەکینەی هاڕین: *( a coffee ~ )* .
(٤) گوشەر؛ مەکینەی میوە گوشین.
(٥) مەکینەی ساف‌ولووس کردنی ڕووی کانزا.
(٦) کارگە؛ کارخانە: *( a textile ~ )* .
(٧) مەکینەی پارە لە سکەدان.
(٨) مەکینەی قاڵب لەسەر هەڵکەندن یا چاپکردن.
(٩) دەزگایەکی کارخانە ئاسایی لەڕووی ڕۆتینەوە (بۆ دەرهێنان‌و دروستکردنی گەلێك شتی چوونیەك): *( The college was only a diploma ~ .)* .
(١٠) شێوەیەکی کاروبار جێبەجێکردنی سست.
(١١) [Slang]، شەڕە مستەکۆڵە؛ شەڕە بۆکس.
*v.t.* (١) هاڕین؛ بردنە ئاش؛ هاڕین لە ئاشدا.
(٢) ساف‌ولووس کردنی ڕووی کانزایی. (٣) لێوار دروستکردن بۆ پارە.
(٤) شڵەقاندن‌و کەف پێکردن. (٥) گێژپێخواردن (ئاژەڵ)؛ گێژپێدان.
(٦) [Slang]، بیرازکردن؛ کوتان؛ بە مستەکۆڵە لێدان.
*v.i.* (١) گێژخواردن؛ بەدەوری یەکدا سووڕانەوە یا گێژخواردن (جەماوەر، ئاژەڵ)؛ پاڵەپەستۆ: *( The crowd was ~ing around.)* .
(٢) [Slang]، شەڕە مستەکۆڵەکردن؛ شەڕە بۆکس کردن.
**run of the mill,** ڕەشۆکی: هەڕەمە؛ ئاسایی؛ بازاڕی.
**through the mill, [Colloq.],** بە تاقیکردنەوە یا بەسەرهاتێکی ناخۆش‌و چاوکەرەوەدا.
**millboard** (mil′bôrd′, mil′bōrd′), *n.* مقەبا (بۆ بەرگی کتێب).
**milldam** (mil′dam′), *n.* (١) پەنداوی ئاش (بۆ بەرزکردنەوەی پلەی ئاو بە ڕادەیەك کە ئاشەکەی پێ بگەڕێ). (٢) millpond .
**millenarian** (mil′ə-nâr′i-ən), *adj.* هی هەزار ساڵی؛ هەزار ساڵە.
*n.* کەسێك کە بڕوای هەبێ بە گەڕانەوەی عیسا و فەرمانڕەوایی بەسەر زەمیندا بۆ هەزار ساڵ.
**millenary** (mil′ə-ner′i), *adj.* (١) هەزار ساڵە؛ هی هەزار ساڵ؛ هەزار ساڵی. (٢) تایبەتی بە گەڕانەوەی عیسا بۆ سەرزەمین‌و فەرمانڕەوایی کردنی بۆ هەزار ساڵ؛ تایبەتی بەو کەسانەی بڕوایان بەم شتە هەیە.
*n.* (١) هەزار (٢) هەزار ساڵ. (٣) یادی هەزار ساڵە.
(٤) کەسێك کە بڕوای هەبێ بە گەڕانەوەی عیسا بۆ سەرزەمین‌و فەرمانڕەوایی کردنی بۆ هەزار ساڵ.
**millennium** (mi-len′i-əm), *n.* (١) هەزار ساڵ؛ ماوەی هەزار ساڵ.
(٢) ئەو هەزار ساڵەی کە گوایە عیسا دەگەڕێتەوە بۆ سەرزەمین‌و فەرمانڕەوایی دەکات. (٣) سەردەمێکی ئاسوودەیی‌و شادی‌و خۆش گوزەرانی؛ سەردەمی زێڕین
**millepede** (mil′ə-pēd′), *n.* هەزارپێ.
**miller** (mil′ēr), *n.* (١) ئاشەوان؛ وەستای ئاش.
(٢) مەکینەی هاڕین.
(٣) مۆریانەیەکی باڵداری لەش، لە ئارداوی چوو.
**millet** (mil′it), *n.* هەرزن؛ گاڵ.
**milli-** (mil′i, mil′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) هەزاریەك: *( millimeter)*
(٢) هەزار *( millifold)* .
**milliard** (mil′yērd, mil′yärd), *n.* ملیار؛ هەزار ملیۆن؛ بلیۆن.
**milligram, milligramme** (mil′ə-gram′), *n.* میلیگرام؛ هەزاریەکی گرامێك.
**milliliter, millilitre** (mil′ə-lē′tēr), *n.* هەزاریەکی لیترێك.
**millimeter, millimetre** (mil′ə-lē′tēr), *n.* میللیمەتر؛ هەزاریەکی مەترێك.
**millimicron** (mil′ə-mī′kron), *n.* هەزاریەکی مایکرۆنێك، واتە ملیۆنیەکی میللیمەترێك.
**milliner** (mil′ə-nēr), *n.* نەخشەکێش، دروستکەر، یا فرۆشیاری شەپقەو سەرپۆشی ژنانە.
**millinery** (mil′ə-ner′i, mil′ə-nēr-i), *n.* (١) شەپقەو سەرپۆشی ژنانە. (٢) شەپقەو سەرپۆشی ژنانە دروستکردن‌و فرۆشتن.
**milling** (mil′iŋ), *n.* (١) هاڕین (دانەوێڵە).
(٢) بڕین‌و ڕێك‌وپێك کردن‌و پوختەکردنی بەرهەمی کارخانە (وەك: قوماش، کانزا... هتد). (٣) لێواری پارە.
(٤) گێژخواردن یا بەدەوری یەکتریدا سووڕانەوەی ئاژەڵ.
(٥) [Slang]، کوتان؛ بیرازکردن؛ دانەبەر مستەکۆڵە.
**million** (mil′yən), *n.* ملیۆن؛ هەزار هەزار
**millionaire, millionnaire** (mil′yən-âr′), *n.* (١) ملیۆنێر؛ خاوەنی ملیۆنێك دۆلار، پاوەند، فرانك... هتد
(٢) کەسێکی زۆر دەوڵەمەند
**millionfold** (mil′yən-fōld′), *adj. & adv.* ملیۆن ئەوەندە
**millionth** (mil′yənth), *adj. & n.* (١) ملیۆنهەم؛ ملیۆنەمین
(٢) ملیۆنیەك.
**milliped, millipede** (mil′ə-ped′), *n.* = millepede.
**millpond** (mil′pond′), *n.* ئەستێلی پەنداوی ئاش.
**millrace** (mil′rās′), *n.* (١) تەووژمی ئاوی ئاش.
(٢) جۆگەی ئاوی ئاش.
**millstone** (mil′stōn′), *n.* (١) بەرداش؛ دەستاڕ.
(٢) بارێکی قورس‌و ناخۆش.
**millstream** (mil′strēm′), *n.* ئاوی ئاش.
**millwright** (mil′rīt′), *n.* وەستای ئاش؛ نەخشەکێش‌و دانەری ئاش.
**milo** (mī′lō), *n.* دانەوێڵەیەکە لە توخمی هەرزن.
**milord** (mi-lôrd′), *n.* بەگزادەی ئینگلیزی؛ نازناوی بەگزادەیەکی وەها (لە دووان لەگەڵیدا بەکاردەهێنرێ).
**milt** (milt), *n.* (١) تۆماوی ماسی. (٢) لووی تۆماوی ماسی.
*v.t.* هێلکەی ماسی چاکردن یا پیتاندن.
**milt** (milt), *n.* سپڵ.
**milter** (mil′tēr), *n.* (١) نێرەماسی لەکاتی جووت بووندا.
(٢) تۆماوی ماسی؛ لووی تۆماوی ماسی.
**Miltonic** (mil-ton′ik), *adj. Also* Miltonian, لەسەر شێوازی هۆنراوەی هۆنەری ئینگلیزی بەناوبانگ " جۆن میلتۆن " : بەرزو سەنگین‌و شکۆدار.
**mime** (mīm), *n.* (١) (ا) شانۆنامەی لاسایی یۆنان‌و ڕۆمانی کۆن.
(ب) گفتوگۆی ئەم جۆرە شانۆنامەیە. (٢) شانۆنامەی لاسایی نوێ.
(٣) نوێنەری شانۆنامەیەکی وەها.
(٤) قەشمەر؛ گاڵتەچی؛ نوێنەرێکی قەشمەر.
(٥) شانۆنامەی بێ گفتوگۆ؛ شانۆنامەی بێ دەنگ.
*v.t.* لاسایی کردنەوە لە شانۆنامەی لاساییدا.
*v.i.* خۆنواندن لە شانۆنامەی بێ گفتوگۆدا؛ خۆنواندن بەبێ دەنگ تەنها بە جووڵانەوەی ئەندامی لەش.
**mimeograph** (mim′i-ə-graf′, mim′i-ə-gräf′), *n.* ڕۆنیۆ؛ ئامێری وێنەی دەقاودەق دەرکردن.
*v.t.* لە ڕۆنیۆ دان؛ وێنەی دەقاودەق دەرکردن بە ڕۆنیۆ.
**mimesis** (mi-mē′sis, mī-mē′sis), *n.* (١) لاسایی کردنەوە (لە وێژەو هونەردا)؛ دەربڕینی وێنەی دەقاودەقی ڕەووشت‌و ووتەی مرۆڤ لە وێژەو هونەردا. (٢) لەیەکچوونی زیندەوەرێك‌و زیندەوەرێکی تر یا

دەورووبەرەکەی و خۆپاراستن و خۆشاردنەوە؛ خۆگۆڕینی هەندێك زیندەوەر وەك دەورووبەرەکەی بۆ خۆپاراستن (وەك: قۆزی).

**mimetic** (mi-met′ik, mī-met′ik), *adj.* (١) لاساییکەرەوەیی؛ لاسایی. (٢) دروزنە؛ درۆ؛ هەر بە رووالەت. (٣) تایبەتی بە لەیەکچوون یا خۆگۆڕینی گیانەوەر بۆ لەیەکچوونی لەگەڵ دەورووبەرەکەیدا.

**mimic** (mim′ik), *adj.* (١) لاساییکەرەوەیی؛ لاساییکەرەوە؛ لاسایی. (٢) دروزنە؛ درۆ. *( ~ battles)* .

*v.t.* (١) لاسایی کردنەوە (بۆ گاڵتەپێکردن)؛ دەمەلاسکێ کردن. (٢) خۆگۆڕین بۆ لەیەکچوون (وەك هەندێ گیانەوەر و دەورووبەرەکەی بۆ خۆپاراستن)

*n.* (١) لاساییکەرەوە (بۆ گاڵتەو پێکەنین)؛ دەمەلاسکێکەر. (٢) نوێنەرێکی لاساییکەرەوە.

**-mimicker** *(n.).*

**mimicry** (mim′ik-ri), *n.* (١) لاسایی کردنەوە؛ لاساییکاری؛ لاسایی؛ دەمەلاسکێ. (٢) لەیەکچوونی گیانەوەرێك و دەورووبەرەکەی یا خۆگۆڕینی بۆ ئەم لەیەکچوون و خۆپاراستن.

**mimosa** (mi-mō′sə, mi-mō′zə), *n.* پووەکە شەرمن: چەند جۆرە درەخت و بنچك و رووەکێکن بە شەرمنی، واتە هەستیاری بۆ رووناکی و دەست لێدانەوە ناسراون.

**mina** (mī′nə), *n.* مەن: یەکەی کێشان و پارەی یۆنانی کۆن.

**minacious** (mi-nā′shəs), *adj.* ترسناك؛ سامناك؛ مەترسی لێکراو.

**minaret** (min′ə-ret′, min′ə-ret′), *n.* منارە.

**minatory** (min′ə-tôr′i, min′ə-tō′ri), *adj.* - minacious.

**mince** (mins), *v.t.* (١) جنین؛ قیمەکردن؛ وردکردن؛ قاشکردن؛ گۆشت کوتان. (٢) کردن بە بەش بەشی زۆر وردەوە. (٣) بە ترزل و نازو خۆ تەسك کردنەوەوە دووان:

*( He ~d his phrases in the presence of the rich.)*

(٤) لەژێر لێوەوە قسەکردن؛ منجەمنج کردن: *( I ~d no words.)* .

*v.i.* خۆ تەسك کردنەوەو ترزل و ناسکی نواندن لە گفتوگۆو رۆیشتندا.

*n.* = mincemeat.

not to mince matters ( or one's words ), قسە لەروو بوون؛ شەرم نەکردن و هیچ نەشاردنەوە؛ بە ئاشکراو بەبێ پێچ وپەنا را دەربڕین.

**mincemeat** (mins′mēt′), *n.* (١) سێوی جنراو و کشمیش و داوودەرمانی تام و بۆن خۆش کە دەکرێتە کێکەوە (هەندێك جار بە گۆشتی قیمەکراوەوە). (٢) [Obs.]: گۆشتی قیمەکراو.

make mincemeat of, (١) جنین؛ پارچەپارچەکردن؛ ونجرونجرکردن. (٢) بەزاندن؛ بەتەواوی بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.

**mince pie,** شیرینییەکی وەك کولیچەیە ناوەکەی پڕ دەکرێ لە سێوی جنراو و کشمیش و داوودەرمانی خۆش.

**mincing** (min′siŋ), *adj. Also* mincy, خۆ تەسککەرەوەو بە درۆ نازکەر (لە گفتوگۆو رۆیشتندا).

**mind** (mīnd), *n.* (١) یاد؛ بیر:

*( This brings to ~ another story.)*

(٢) (ا) را؛ هەڵوێست؛ ئەوەی لە مێشکدایە: *( Speak your ~ .)* .

(ب) نیاز؛ حەز؛ بەتەمابوون: *( I have a good ~ to go.)* .

(٣) (ا) هۆش؛ بیر؛ بیروهۆش. (ب) زیرەکی؛ ژیری؛ مێشك.

(ج) سەرجەمی ئەو بەسەرهاتانەی کە بەسەر کەسێکدا هاتبن و لەبیری بێ.

(د) دەروون.

(٤) مێشك؛ بیروهۆش؛ بیر: *( He has lost his ~ .)* .

(٥) کەسی زیرەك و دانا؛ پیاوی زرنگ؛ بلیمەت:

*( the great ~s of this century)*

(٦) شێوەی بیرکردنەوەو هەڵوێست؛ هەڵوێست؛ بیرورا:

*( the reactionary ~ )*

(٧) هۆش (فەلسەفە).

(٨) (ا) یادکردنەوەی مردوو وەك چلە (خاچ پەرستی).

(ب) [M-]، خودا؛ یەزدان. (پێشی دەووترێ: " Divine Mind " ) .

*v.t.* (١) هەستپێکردن؛ بینین؛ سەیرکردن؛ ئاگا لێ بوون.

(٢) سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان: *( M~ your own business.)* .

(٣) بەگوێ کردن؛ بەقسەکردن؛ گوێ ڕایەڵی کردن:

*( The dog ~s his master.)*

(٤) کۆشش کردن.

(٥) چاودێری کردن؛ ئاگا لێ بوون؛ سەرەوکاری کردن: *( M~ the baby.)* .

(٦) وریابوون؛ ئاگا لە خۆ بوون:

*( M~ your tongue.; M~ those rickety stairs.)*

(٧) (ا) بە لاوە گرنگ بوون؛ بەتەنگەوەهاتن.

(ب) بەدڵ نەبوون؛ حەز لێ نەکردن؛ نەویستن: *( I don't ~ the cold.)* .

(٨) [Dial.]، لەیادبوون؛ لەبیربوون.

(٩) [Dial.]، بەتەمابوون؛ نیازبوون.

(١٠) [Dial. or Archaic]، خستنەوە یاد؛ بیرخستنەوە.

*v.i.* (١) گوێ پێدان؛ سەرنج پێدان؛ باك بوون.

(٢) گوێ ڕایەڵ کردن؛ ملدان؛ بەقسەکردن. (٣) وریابوون؛ ئاگا لە خۆ بوون

(٤) (ا) بەتەنگەوەهاتن؛ بە لاوە گرنگ بوون.

(ب) بەدڵ نەبوون؛ حەزنەکردن؛ نەویستن.

bear in mind, لەبیربوون؛ لەیادبوون؛ لەبیرنەچوون.

be in one's right mind, بیروهۆش لای خۆ بوون.

be of one mind, را یەك بوون؛ لەسەر یەك را بوون.

be of the same mind, را یەك بوون؛ لەسەر یەك را بوون.

be of two minds, دوودڵ بوون؛ دوودڵی کردن؛ ڕاڕابوون؛ ڕاڕایی کردن.

be out of one's mind, (١) شێت بوون؛ مێشك تێکچوون. (٢) بیروهۆش لە لای خۆ نەمان (لە مەراق و خەفەتدا).

call to mind, (١) لەبیربوون؛ لەیادبوون. (٢) بیرخستنەوە.

change one's mind, ڕای خۆ گۆڕین؛ را گۆڕین؛ نیازو هەڵوێست گۆڕین.

give a person a piece of one's mind, سەرزەنشتکردن؛ ناپەسەندی خۆ بەرامبەر کەسێك دەربڕین بۆ ئەو کەسە؛ قسە پێ ووتن؛ چی بە دەمدا هاتن پێ ووتن:

*( I am going to give him a piece of my mind.)*

have a ( good or great ) mind to, زۆر حەزکردن؛ پڕ بە دڵ ویستن.

have half a mind to, نەختێك حەزکردن.

have in mind, (١) لەبیربوون؛ لەیادبوون؛ لەبیرنەچوون. (٢) بیرلێکردنەوە. (٣) نیازبوون؛ ویستن.

keep in mind, لەبیربوون؛ لەیادبوون؛ لەبیرنەچوون.

keep one's mind on, مێشك خستنە سەر؛ سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان.

know one's mind, لە بیروڕاو هەست و نەستی خۆ دڵنیابوون؛ خۆ باش ناسین؛ خۆ ناسین.

make up one's mind, بڕیاردان:

*( I have made up my mind about the car; I want to buy it.)*

meeting of minds, پێککەوتن؛ یەك دڵی؛ یەك دڵ بوون.

never mind, قەی ناکا؛ گوێ مەدەرێ؛ گرنگ نییە گوێی مەدەرێ.

on one's mind, مەراق بوون؛ لە خەیاڵدا بوون و مێشك پێوە خەریك بوون؛ پێوە سەرقاڵ بوون.

out of sight, out of mind, کە شت لەبەرچاو نەبوو زوو لەبیر دەچێتەوە؛ لەبیرچوونەوەی کەسێك (بەتایبەتی دڵدارێك) هەر کە لەبەرچاو نەما؛ دووری دەبێتە هۆی بیرچوونەوە.

pass out of mind, لەبیرچوونەوە؛ لەبیر خۆ بردنەوە.

put in mind, بیرخستنەوە؛ خستنەوە یاد.

put out of one's mind, لەبیر خۆ بردنەوە؛ بیر لێ نەکردنەوە.

set one's mind on, سووربوون لەسەر؛ بڕیار لەسەر دان و را نەگۆڕین؛ ویستن.

**speak one's mind,** ڕای خۆ دەربڕین بەبێ پێچ‌وپەنا.
**take one's mind off,** لە مێشك دەرکردن؛ لەبیری خۆ بردنەوە.
**to one's mind,** بە ڕای خۆ؛ بە لای خۆوە؛ بە بیروڕای خۆ.
**minded** (mīn′did), *adj.* (١) مێشکێکی تایبەتی هەیە: *( small- ~ ; evil- ~ ; strong- ~ )*
(٢) مەیلدار؛ مەیل وابوو.
**mindful** (mīnd′fəl), *adj.* بەئاگا؛ ئاگادار؛ وریا؛ لەبیرنەچوو؛ بە باك: *( I am ~ of the danger.)* .
**mindless** (mīnd′lis), *adj.* (١) بێ مێشك؛ کەر.
(٢) ( ~ **of** )، بێباك؛ بێ گوێ؛ بێ هۆش.
**mind reader,** مێشك خوێنەرەوە؛ مێشك‌و دڵی خەڵك خوێنەرەوە.
**mind's eye,** خەیاڵ؛ توانای شت هێنانە بەرچاو.
**mine** (mīn), *possessive pron.* (١) هی من: *( a friend of ~ ; That book is ~ . ; M~ are letter.)*
(٢) هی من؛ هی خۆم: *( ~ eyes; ~ honor; mother ~ )* .
**mine** (mīn), *n.* (١) کان؛ کانگە (٢) کانزا.
(٣) کانگا (مەجاز)؛ سەرچاوەیەکی بێ بن‌و بەنرخ: *( a ~ of information)* .
(٤) مین (٥) بنکەندی ژێر جێگای دوژمن (بۆ مین تەقاندنەوە).
*v.i.* (١) کانزاکردن؛ کانزا لە کان دەرهێنان.
(٢) تونێل لێدان لەژێر جێی دوژمندا. (٣) مین دانان؛ مین تەقاندنەوە.
*v.t.* (١) زەوی هەڵکەندن (بۆ کانزا)؛ کانگە هەڵکەندن یا لێدان.
(٢) کانکردن؛ کانزا لە کان دەرهێنان.
(٣) وێرانکردن بە مین؛ مین نانەوە؛ مین تێدا دانان؛ مین تێدا تەقاندنەوە.
(٤) بنکەنکردن (بۆ ڕووخاندن‌و وێرانکردن)؛ بە دزییەوە بنکەنکردن‌و زیان لێدان.
**mine detector,** مین دۆزەرەوە: ئامێرێکی ئەلەکترۆموگناتیسییە.
**mine field,** زەوی مین ڕێژکراو؛ زەوی یا ئاوی مین تێدا دانراو؛ مەیدانی مین
**mine-layer** (mīn′lā′yēr), *n.* کەشتی مین دانەر لەناو ئاودا.
**miner** (mīn′ēr), *n.* (١) کارگەری کان؛ کرێکاری کانگە.
(٢) سەربازی مین نێرەوە؛ مین نێرەوە.
**mineral** (min′ēr-əl, min′rəl), *n.* کانزا؛ کان
*adj.* (١) کانزایی؛ کانی.
(٢) کانز تێکراو؛ کانزادار: *( ~ water )* .
**mineralize** (min′ēr-ə-līz′, min′rə-līz′), *v.t.* (١) کردن بە کانزا؛ گۆڕین بۆ کان. (٢) وەك بەردلێکردن (شتی زیندوو).
(٣) کانزاتێکردن (ئاو)؛ پڕکردن لە کان
-**mineralization** *(n.)*; **mineralizer** *(n.)*.
**mineralogical** (min′ēr-ə-loj′i-k'l), *adj.* کانزایی؛ کانی
**mineralogist** (min′ēr-al′ə-jist, min′ēr-äl′ə-jist), *n.* زانای کان؛ کانزاناس
**mineralogy** (min′ēr-al′ə-ji, min′ēr-äl′ə-ji), *n.* (١) زانستی کان؛ کانزاناسی. (٢) پەرتووك یا ووتارێکە دەربارەی کانزا.
**mineral oil,** ڕۆنی کانزایی: (ا) پەترۆڵ؛ نەوتی خاو.
(ب) ڕۆنی لە نەوتی خاو دەرهێنراو (وەك دەرمانی ڕەوانی).
**mineral pitch,** قیر.
**mineral spring,** گەراو؛ کانیاوی کانزایی.
**mineral water,** کانیاو؛ ئاوی کانزایی.
**Minerva** (mi-nūr′və), *n.* بانوخوای ژیری‌و دانایی ڕۆمانی کۆنە.
**minestrone** (min′ə-strō′ni), *n.* شلەیەکی سەوزەو مەعکەرۆنی‌و گۆشتە
**minesweeper,** مینماڵ؛ کەشتی لابەرو پووچەڵکەرەوەی مینی دوژمن لەناو دەریادا.
**mingle** (miŋ′g'l), *v.t.* تێکەڵاوکردن.
*v.i.* تێکەڵاوبوون؛ چوونە ناو یەکەوە: *( to ~ with the crowd, people, etc.; truth ~d with falsehood)*
**mini-** (min′i), پێشگرێکە بەمانای: بچووك کراوە؛ بچووك: *( miniskirt, minicar)*
**miniature** (min′i-ə-chēr, min′i-chēr), *n.* (١) نیگار یا وێنەی کێشراوی بچووك. (٢) نیگار یا وێنەیەکی بچووکی لەسەر سەدەف کێشراو.
(٣) وێنەیەکی دەقاودەقی بچووك یا بچووك کراوە.
*adj.* بچووك؛ بچووك کراوە؛ وێنەی بچووك یا بچووك کراوە.
**in miniature,** بچووك کراوە؛ بە بچووك کراوەیی.
**miniaturize** (min′i-ə-chēr-īz′), *v.t.* بە بچووکی درووستکردن (ئامێری پیشەسازی‌و سوپایی)؛ بچووك کردنەوە.
**minify** (min′ə-fī′), *v.t.* لە گرنگی کەمکردنەوە؛ بە کەمتر یا بچووکتر پیشاندان.
**minim** (min′im), *n.* (١) بچووکترین پێوانەی شلەیە (کە بریتییە لە دڵۆپێك). (٢) تۆزێك؛ نەختێك؛ زۆر کەم. (٣) نیونۆتە (مۆسیقا).
*adj.* بچووکترین؛ کەمترین.
**minima** (min′ə-mə), *alternative plural of* **minimum.**
**minimal** (min′ə-m'l), *adj.* کەمترین.
**minimize** (min′ə-mīz′), *v.t.* (١) کەمکردنەوە بۆ پەڕی ئەم پەڕ؛ کەمترین کردنەوە؛ ئێجگار کەمکردنەوە. (٢) لە نرخ، گرنگی، مەترسی، یا پلە کەمکردنەوە هەتا بتوانرێ: *( to ~ the importance, risk, etc.)* .
**minimum** (min′ə-məm), *n.* کەمترین ژمارە، پلە، هەند... هتد؛ پەڕی ئەم پەڕ؛ بەلای کەمەوە.
*adj.* کەمترین (ژمارە، هەند، پلە... هتد)؛ ئەم پەڕی؛ بەلای کەمەوە؛ پەڕی ئەم پەڕ.
**minimum wage,** (١) کەمترین کرێ (کە دەبێ بدرێ بە کرێکار بەپێی یاسا)؛ پەڕی ئەم پەڕی کرێی کرێکار. (٢) کرێی گوزەران؛ کرێی مەمرەومەژی.
**mining** (mīn′iŋ), *n.* (١) دەرهێنانی کانزا لە ژێرزەمیندا؛ کانزاکاری.
(٢) مین نانەوە؛ مین تێدا دانان.
**minion** (min′yən), *n.* (١) نۆکەر؛ کلك؛ دەسکەلا.
(٢) [Obs.]، دۆست؛ هاوجێ. (٣) قەبارەیەکی بچووکی تیپ (چاپەمەنی).
*adj.* [Rare], ناسکۆڵە؛ بچووك‌و ناسك.
**minion of the law,** = **a policeman.**
**mini-skirt** (min′i-skūrt′), *n.* تەنوورەی کورت.
**minister** (min′is-tēr), *n.* (١) شالیار؛ وەزیر.
(٢) کاربەدەستێکی باڵیۆزخانەیە پلەیەك لەخوار باڵیۆزەوەیە.
(٣) قەشە؛ کەشیش. (٤) دەسکەلا؛ داردەست.
*v.t.* (١) [Archaic] ، پێدان؛ یارمەتیدان.
(٢) پێ هەڵسان (ئەرکێکی ئاینی لە کڵێسەدا).
*v.i.* (١) بەردەستی کردن؛ کردن لەبری کەسێکی تر.
(٢) یارمەتیدان؛ خزمەتکردن (نەخۆش)؛ دەرمان پێدان: *( to ~ to the wants of a sick man)*
**ministerial** (min′is-têr′i-əl), *adj.* (١) هی وەزیر یا وەزیران؛ شالیاری: *( a ~ meeting)* .
(٢) بەڕێوەبەری. (٣) بەردەست؛ بەردەستی.
(٤) قەشەیی. (٥) هۆیی؛ هۆکاری.
**minister plenipotentiary,** کاربەدەستێکی دیبلۆماسی دەسەڵات پێدراوە لەخوار باڵیۆزەوەیە.
**ministrant** (min′is-trənt), *adj. & n.* بەردەست؛ یارمەتیدەر؛ خزمەتکەر.
**ministration** (min′is-trā′shən), *n.* (١) ئیش‌وکاری قەشە؛ قەشەیی. (٢) خزمەت؛ یارمەتی.
**ministry** (min′is-tri), *n.* (١) خزمەت؛ یارمەتی.
(٢) قەشەیی؛ ئیش‌وکاری قەشە. (٣) قەشەکان؛ پیاوە ئاینییەکانی کڵێسە.
(٤) (ا) وەزارەت: *( the ~ of education)* .
(ب) ماوەی کاربەدەستێتی شالیار.

(ج) شالیاران: سەرجەمی شالیاران.

**miniver** (min′ə-vēr), *n.* کەوڵی سپی: فەروەی سپی.

**mink** (miŋk), *n.* (١) گیاندارێکی تەڕو ووشکانی گۆشتخۆری لاق کورتی پێ پەردەدارە لە دەڵەك دەچێ. (٢) کەوڵە نەرمو ئەستوورو بریقەدارەکەی ئەم گیاندارە. (٣) چاکەتی لەم جۆرە کەوڵە دروستکراو.

**minnow** (min′ō), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی بچووکە.

**minor** (mī′nēr), *adj.* (١) کەمتر: بچووکتر

(٢) ناگرنگ: ناسەرەکی؛ پلە نزم: *( a ~ poet)* .

(٣) هیچوپووچ؛ مەترسی لێ ناکرێ: *( ~ difficulties; a ~ injury)* .

(٤) هەرزە: تەمەن لە بیست‌ویەك ساڵ کەمتر؛ منداڵ.

(٥) هی ڕشتەی ناسەرەکی (زانکۆ).

(٦) تەسك (ژیربێژی)؛ ناگشتی.

(٧) کورت (نۆتەی مۆسیقا)؛ غەمگین (ئاوان).

*v.i.* خوێندنی ڕشتەی ناسەرەکی: *( He will ~ in chemistry.)* .

*n.* (١) کەسێکی تەمەن لە بیست‌ویەك ساڵ کەمتر؛ هەرزە؛ منداڵ.

(٢) ڕشتەی ناسەرەکی (زانکۆ).

(٣) گریمانەیەکی ناسەرەکی یا ناگشتی (ژیربێژی).

(٤) نۆتەی کورت (مۆسیقا).

**minority** (mə-nôr′ə-ti, mī-nor′ə-ti), *n.* (١) بەشی کەمی؛ کەمتر لە نیوە (٢) کەمایەتی نەتەوەیی، ڕەگەزی، ئایینی، یا ڕامیاری.

(٣) کاتی لە بیست‌ویەك ساڵ کەمتر؛ کاتی منداڵی و هەرزەیی.

**minor-league** (mī′nēr-lēg′), *adj.* (١) هی تیپی وەرزشی بچووك یا ناسەرەکی (٢) ناسەرەکی؛ ناوەندی؛ ناگرنگ؛ بچووك؛ هیچوپووچ: *( a ~ politician)*

**minor league,** تیپی وەرزشی ناسەرەکی هەرزە (بەتایبەتی بەیسبۆل).

**Minotaur** (min′ə-tôr′), *n.* دەعبایەکی ئەفسانەیی‌یە بە لەشی پیاو و کەللەی گاوە (ئەفسانەی یۆنانی).

**minster** (min′stēr), *n.* (١) کڵێسەی پەرستگا؛ کڵێسە.

(٢) کڵێسەی گەورە.

**minstrel** (min′strəl), *n.* (١) بەستەو گۆرانی بێژی گەڕۆك بە گیتارەوە (بەتایبەتی لە سەدانی ناوەڕاستدا)؛ شایەری گەڕۆك.

(٢) [Poetic]، هونەر؛ گۆرانی بێژ؛ مۆسیقاژەن.

(٣) ئەندامی تیپی " minstrel show " . (ووشەی دوایی ببینە).

**minstrel show,** خۆنوواندنی تیپێکی نوواندەری گاڵتەبێژی دەموچاو ڕەش کراوە کە بریتی بوو لە گۆرانی و گاڵتەوگەپ.

**minstrelsy** (min′strəl-si), *n.* (١) پیشەی بەستەو گۆرانی بێژی گەڕۆك بە ئامێری مۆسیقاوە لە سەدانی ناوەڕاستدا.

(٢) دەستەیەك بەستەو گۆرانی بێژی گەڕۆك بە ئامێری مۆسیقاوە.

(٣) کۆمەڵێك بەستەو گۆرانی وەها.

**mint** (mint), *n.* (١) شوێنی سکەلێدان؛ سکەخانە؛ دراوخانە.

(٢) سەرچاوەی بێ بن؛ شتی لەبن نەهاتوو: *( a ~ of ideas)* .

(٣) شوێن یا سەرچاوەی دروستکردن؛ جێی هەڵبەستن یا داتاشین.

*adj.* . *( a postage stamp in ~ condition)* تازەو نفت‌ونوێ؛ تازە؛ نوێ:

*v.t.* (١) سکەلێدان.

(٢) دروستکردن؛ هەڵبەستن؛ داتاشین؛ ڕێکخستن؛ داڕشتن: *( a phrase ~ed for one occasion and audience)*

**mint** (mint), *n.* (١) پونگە؛ نەعنا. (٢) بنێشت یا شیرینی بۆن پونگاوی.

**mintage** (min′tij), *n.* (١) سکەلێدان.

(٢) دروستکردن؛ داتاشین؛ داڕشتن؛ هەڵبەستن. (٣) سکە.

(٤) کرێی سکەلێدان. (٥) نەقشی سەر پارەی ڕەق.

**minuend** (min′ū-end′), *n.* ژمارەی لێ دەرکراو (ژمارەوپێوان)؛ ئەو ژمارەیەیە کە ژمارەیەکی تری لێ دەردەکرێ.

**minuet** (min′ū-et′), *n.* (١) جۆرە سەمایەکی هێواش.

(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە

**minus** (mī′nəs), *prep.* (١) لێی دەرچێ (ژمارەوپێوان)؛ کەمتر: *( four ~ two)*

(٢) [Colloq.]، بەبێ: *( ~ a finger)*

*adj.* (١) هی نیشانەی لێ دەرکردن (ژمارەوپێوان): *( a ~ sign "-" )* .

(٢) کەم. (٣) نەختێك کەمتر لە؛ نەختێك لەخوار (نمرە، پلە): *( a grade of A ~ )*

*n.* (١) نیشانەی لێ دەرکردن (ژمارەوپێوان). (٢) بڕێکی کەم.

**minuscule** (mi-nus′kūl), *n.* (١) جۆرە نووسینێکی کۆنە بە تیپی بچووك (٢) تیپێکی ئەم جۆرە نووسینە. (٣) تیپی بچووك.

*adj.* (١) بە تیپی بچووك نووسراو. (٢) زۆر بچووك؛ بچووك.

**minus sign,** نیشانەی لێ دەرکردن: " − " (ژمارەوپێوان).

**minute** (min′it), *n.* (١) خولەك؛ دەقیقە.

(٢) ماوەیەکی زۆر کورت؛ هەناسەیەك: *( I'll come in a ~ .)* .

(٣) (*pl.*)، تۆمارنامەی ڕوودانی کۆبوونەوەیەك: *( the ~s of a meeting)* .

(٤) یادنامە.

*v.t.* (١) تۆمارکردنی ڕوودانی کۆبوونەوەیەك.

(٢) لە تۆمارنامەی ڕوودانی کۆبوونەوەیەکدا تۆمارکردن.

(٣) بەووردی کات ڕاگرتن.

**the minute (that),** هەر کە؛ هەر یەکسەر کە: *( I'll tell him the minute (that) he gets here. )*

**to the minute,** هەتا دوا خوولەك؛ زۆر بەووردی (کات ڕێکخستن)؛ بەتەواوی (کات): *( The day was organized to the minute.)*

**up to the minute,** دواترین (دەنگوباس، مۆدە)؛ هەتا ئێستا: *( up to the minute news, fashion, etc.)*

**minute** (mī-nōōt′, mi-nūt′), *adj.* (١) زۆر بچووك؛ بچکۆلە: *( ~ particles of dust)*

(٢) هیچوپووچ؛ بێ بایەخ

(٣) وورد؛ زۆر وورد: *( ~ descriptions, details, etc.)* .

**minute hand,** میلی خولەك (کاتژمێر).

**minutely** (min′it-li), *adj.* (١) خولەکی؛ هەموو خولەکێك ڕوودەدات.

(٢) زوو زوو ڕوودەدات.

*adv.* (١) هەموو خولەکێك. (٢) زوو زوو؛ بەردەوام.

**minutely** (mī-nōōt′li, mi-nūt′li), *adv.* بەووردی؛ زۆر بەووردی.

**minuteman, Minuteman** (min′it-man′), *n.* خەباتکەری هەمیشە ئامادە بۆ جەنگاندن (لە شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکادا).

**minuteness** (mī-nōōt′nis, mi-nūt′nis), *n.* (١) زۆر بچووکی؛ بچکۆلەیی. (٢) ووردی؛ زۆر ووردی؛ گوێدان بە شتی وورد؛ ووردەکاری.

**minute steak,** پارچە گۆشتی تەنکی زوو برژێنراو.

**minutiae** (mi-nū′shi-ē′), *n.pl.* ( *sing.* **minutia**), شتی ووردو دووروردرێژی هیچوپووچ.

**minx** (miŋks), *n.* کچێکی بێ شەرمی بێ حەیا.

**miracle** (mir′ə-k'l), *n.* (١) ڕوودانێکی لە سرووشت بەدەر (ئایین)؛ موعجیزە. (٢) ڕوودانێکی سەرنجڕاکێش؛ شتێکی سەیرو نائاسایی. (٣) نموونە. (٤) **a miracle play**

**miracle play,** شانۆنامەیەکی سەدەکانی ناوەڕاستە دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەرەکان و پیاوچاکانی موعجیزەکار.

**miraculous** (mi-rak′yoo-ləs), *adj.* (١) لە سرووشت بەدەر؛ وەك موعجیزە وایە: *( a ~ event)* .

(٢) زۆر سەیر؛ سەرنجڕاکێش؛ نائاسا. (٣) موعجیزەکار.

**mirage** (mi-räzh′), *n.* (١) سەراو؛ تراوێلکە.

(٢) کڵاوی بابردوو؛ زڕەخەو؛ شتی نەدیتە.

**mire** (mīr), *n.* (١) زۆنگاو (٢) قوڕاو؛ قوڕاووچڵپاو (مەجاز): *( to be in the ~ ; to drag someone through the ~ )*

*v.t.* (١) لە قوڕاووچڵپاودا چەقاندن

(٢) قوڕاوی کردن؛ قوڕاووچڵپاو لێ هەڵپڕژاندن؛ بە قوڕاودا ڕاکێشان (مەجاز).

*v.i.* (١) چەقین؛ لە قوڕاودا چەقین؛ وەستان. (٢) قوڕاوی بوون؛ پیس بوون.

**mirk** (mûrk), *n.* = **murk.**
**mirky** (mûr′ki), *adj.* = **murky.**
**mirror** (mir′ẽr), *n.* (١) ئاوێنه
(٢) شتی پیشانده‌ر؛ شتی ده‌رخه‌ر:
*( The film is a ~ of the times we live in.)*
(٣) نموونه.
*v.t.* دانه‌وه (شه‌وق، وێنه)؛ پیشاندان یا ده‌رخستن وه‌ك به ئاوێنه:
*( The water ~s a still sky.; The book ~s the conflict in the author.)*
**mirth** (mûrth), *n.* خۆشی‌وشادی؛ كه‌یف‌و زه‌ماوه‌ند.
**mirthful** (mûrth′fəl), *adj.* پڕ له خۆشی‌وشادی؛ به‌كه‌یف؛ دڵخۆش؛ خۆش (كات).
**mirthless** (mûrth′lis), *adj.* غه‌مگین؛ په‌ست؛ بێ كه‌یف‌وخۆشی.
**miry** (mīr′i), *adj.* (١) زۆنگاوی. (٢) قوڕاوی؛ قوڕوچڵپاوی.
**mis-** (mis), پێشگرێكه به‌مانای: هه‌ڵه؛ به هه‌ڵه؛ به‌د؛ خراپ؛ چه‌وت؛ نادرووست *( misplace, misconduct)* .
**misadventure** (mis′əd-ven′chẽr), *n.* كارێكی خۆترێن؛ كارێكی به‌د، چه‌وت، نادرووست، یا ناسه‌ركه‌وتوو.
**misadvise** (mis′ad-vīz′), *v.t.* ئامۆژگاری هه‌ڵه یا خراپ كردن.
**misalliance** (mis′ə-lī′əns), *n.* هاوپه‌یمانی یا یه‌كگرتنێكی نابه‌جێ‌و هه‌ڵه‌و نه‌گونجاو (به‌تایبه‌تی ژنهێنان‌و شووكردن).
**misally** (mis′ə-lī′), *v.t.* به هه‌ڵه یه‌كگرتن یا په‌یمان به‌ستن (به‌تایبه‌تی ژنهێنان‌و شووكردن).
**misanthrope** (mis′ən-thrōp′, miz′ən-thrōp′), *n.* *Also*- **misanthropist,** حه‌ز له مرۆڤ نه‌كه‌ر؛ كه‌سێكه كه گومان‌و ڕقی له هه‌موو مرۆڤێك بێت؛ مرۆڤ نه‌خواز.
**misanthropic** (mis′ən-throp′ik), *adj.* دژ به مرۆڤ‌و مرۆڤایه‌تی؛ حه‌ز له مرۆڤ نه‌كه‌ر؛ مرۆڤ نه‌خواز.
**misanthropy** (mis-an′thrə-pi), *n.* ڕق له مرۆڤ بوون؛ قین‌و گومان له مرۆڤ بوون.
**misapplication** (mis′ap-lə-kā′shən), *n.* به‌خراپی به‌كارهێنان؛ به نابه‌جێیی به‌كارهێنران.
**misapply** (mis′ə-plī′), *v.t.* (١) به خراپی یا ناپه‌سه‌ندی به‌كارهێنان:
*( He ~ies his energies.)*
(٢) به ناپاكانه‌و سه‌رچه‌وتانه به‌كارهێنان؛ به‌فیڕۆدان (پاره):
*( He ~ied the company's money.)*
**misapprehend** (mis′ap-ri-hend′), *v.t.* به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛ خراپ تێگه‌یشتن.
**misapprehension** (mis′ap-ri-hen′shən), *n.* تێگه‌یشتن به هه‌ڵه؛ خراپ تێگه‌یشتن.
**misappropriate** (mis′ə-prō′pri-āt′), *v.t.* (١) بۆ شتی خراپ دانان یا ته‌رخان كردن (پاره)؛ به هه‌ڵه بۆ دانان؛ به‌فیڕۆدان. (٢) دزین:
*( to ~ the company's money)*
**-misappropriation** *(n.).*
**misbecome** (mis′bi-kum′), *v.t.* نه‌شیان؛ لێ نه‌هاتن:
*( What you've done ~s your place.)*
**misbegot** (mis′bi-got′), *adj.* = **misbegotten.**
**misbegotten** (mis′bi-got′′n), *adj.* زۆڵ.
**misbehave** (mis′bi-hāv′), *v.i. & v.t.* ڕه‌ووشتی ناشرین نواندن؛ به‌دڕه‌فتاری كردن؛ بێ حه‌یایی كردن.
**misbehavior, misbehaviour** (mis′bi-hāv′yẽr), *n.* بێ حه‌یایی؛ به‌دڕه‌فتاری؛ ڕه‌ووشتی ناشرین؛ كرده‌وه‌ی خراپ.
**misbelief** (mis′bə-lēf′), *n.* بیروبڕوای چه‌وت (به‌تایبه‌تی ئاینی)؛ ڕای هه‌ڵه یا چه‌وت.
**misbelieve** (mis′bə-lēv′), *v.i.* به هه‌ڵه بڕواكردن؛ بڕوابوون به شتی چه‌وت یا هه‌ڵه.
**miscalculate** (mis-kal′kyoo-lāt′), *v.t. & v.i.* به هه‌ڵه ژماردن؛ به هه‌ڵه‌داچوون؛ به هه‌ڵه ڕه‌چاوكردن.
**-miscalculation** *(n.).*
**miscall** (mis-kôl′), *v.t.* (١) به هه‌ڵه ناوهێنان؛ ناوی هه‌ڵه لێنان. (٢) [Obs. or British Dial.]، جوێن پێدان؛ سووك كردن.
**miscarriage** (mis-kar′ij), *n.* (١) نه‌هێنانه‌دی؛ جێبه‌جێ نه‌كردن؛ به چه‌وتی كردن (دادپرسی): *( a ~ of justice)* .
(٢) (ا) نه‌گه‌یشتنه جێی خۆی (پۆسته، بار... هتد).
(ب) نه‌گه‌یشتنه ئامانج؛ سه‌رنه‌كه‌وتن.
(٣) منداڵ له‌بارچوون؛ به‌رفڕێدان؛ به‌راویته‌بوون.
**miscarry** (mis-kar′i), *v.i.* (١) سه‌رنه‌كه‌وتن؛ نه‌گه‌یشتنه ئامانج؛ نه‌هاتنه‌دی: *( All his plans ~ied.)* .
(٢) نه‌گه‌یشتنه جێی خۆی (نامه، بار، پۆسته).
(٣) منداڵ له‌بارچوون؛ به‌راویته‌بوون؛ به‌رفڕێدان: *( She ~ied.)* .
**miscast** (mis-kast′, mis-käst′), *v.t.* (١) ده‌ورێكی نه‌گونجاو یا لێ نه‌هاتوو دان به نوێنه‌ر له شانۆنامه یا فیلمێكدا.
(٢) دابه‌شكردنی ده‌وره‌كانی شانۆنامه‌یه‌ك به هه‌ڵه یا به چه‌وتی.
**miscegenation** (mis′i-jə-nā′shən), *n.* دووڕه‌گی؛ تێكه‌ڵاوی نێوان ڕه‌گه‌زی جیا له‌ڕێی ژنهێنانه‌وه (به‌تایبه‌تی له‌نێوان ڕه‌ش‌و سپی له ئه‌مه‌ریكادا).
**miscellanea** (mis′′l-ā′ni-ə), *n.pl.* كۆمه‌ڵێكی جۆراوجۆر به‌تایبه‌تی به‌رهه‌می ویژه‌یی
**miscellaneous** (mis′′l-ā′ni-əs), *adj.* (١) هه‌مه‌ڕه‌نگ؛ هه‌مه‌جۆر؛ تێكه‌ڵ؛ جۆراوجۆر. (٢) شێوه‌و توانای جۆراوجۆر هه‌بوو؛ جۆره‌ها باری هه‌یه.
**miscellany** (mis′′l-ā′ni), *n.* (١) كۆمه‌ڵێكی جۆراوجۆر به‌تایبه‌تی به‌رهه‌می ویژه‌یی. (٢) (*pl.*)، په‌ڕتووكێكی به‌رهه‌می ویژه‌یی جۆراوجۆر.
**mischance** (mis-chans′, mis-chäns′), *n.* (١) كاره‌سات؛ ڕووداوێكی ناخۆش. (٢) به‌دبه‌ختی؛ نه‌گبه‌تی؛ بێ به‌ختی.
**mischief** (mis′chif), *n.* (١) زیان (به‌تایبه‌تی كه مرۆڤ بیدا).
(٢) (ا) به‌دكاری؛ كاری ناپه‌سه‌ند. (ب) به‌دكار؛ زیانبه‌خش.
(٣) (ا) كه‌تن؛ گۆبه‌ن. (ب) هاروهاجی.
**mischief-maker** (mis′chif-māk′ẽr), *n.* فیتنه‌چی؛ شه‌یتان؛ زیانبه‌خش؛ به‌گۆبه‌ن.
**mischievous** (mis′chi-vəs), *adj.* (١) زیانبه‌خش؛ به‌دكار.
(٢) كه‌تنباز؛ به‌گۆبه‌ن.
(٣) بێ حه‌یا (منداڵ)؛ هاروهاج؛ شه‌یتان.
**miscible** (mis′ə-b′l), *adj.* به ئاسانی تێكه‌ڵاو ده‌كرێ (كیمیا).
**-miscibility** *(n.).*
**misconceive** (mis′kən-sēv′), *v.t. & v.i.* به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه لێكدانه‌وه؛ خراپ تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه‌دا چوون.
**misconception** (mis′kən-sep′shən), *n.* به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه لێكدانه‌وه؛ بیری هه‌ڵه؛ هه‌ڵه؛ بیروبڕوایه‌كی چه‌وت؛ به هه‌ڵه‌دا چوونێك.
**misconduct** (mis′kən-dukt′), *v.t.* (١) به خراپی بردن به‌ڕێوه؛ به چه‌وتی كردن. (٢) به‌دڕه‌فتاری كردن؛ ڕه‌ووشتی ناشرین نواندن.
*n.* (١) كاری چه‌وت‌و قه‌ده‌غه (وه‌ك به‌رتیل وه‌رگرتن).
(٢) به‌دڕه‌فتاری (وه‌ك داوێن پیسی)؛ ڕه‌ووشتی ناشرین.
**misconstruction** (mis′kən-struk′shən), *n.* (١) لێكدانه‌وه‌ی هه‌ڵه؛ به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛ به‌هه‌ڵه‌داچوون. (٢) به هه‌ڵه داڕشتنی ڕسته یا ده‌سته‌واژه.
**misconstrue** (mis′kən-strōō′, mis-kon′strōō), *v.t.* به هه‌ڵه لێكدانه‌وه؛ به‌هه‌ڵه‌داچوون؛ به هه‌ڵه تێگه‌یشتن.
**miscount** (mis-kount′), *v.t. & v.i.* به هه‌ڵه ژماردن.
*n.* به هه‌ڵه ژماردن (وه‌ك ده‌نگ له هه‌ڵبژاردنێكدا).
**miscreancy** (mis′kri-ən-si), *n.* به‌دی؛ پیسی؛ خراپی؛

ناپەسەندی

**miscreant** (mis′kri-ənt), *adj.* (١) بەد؛ پیس؛ ناپەسەند؛ بەدکار (٢) [Archaic]، خوانەناس؛ کافر.

*n.* (١) کەسێکی پیس و ناپەسەند؛ بەدکار؛ تاوانبار. (٢) [Archaic]، خوانەناسێك؛ کافر.

**miscreate** (mis′kri-āt′), *v.t.* تێکچوواندن: بە چەوتی، ناقۆلایی، یا ناشرینی دروستکردن.

*adj.* [Rare], تێکچوو (شێوە)؛ ناقۆلا؛ خواروخێچ.

**miscue** (mis-kū′), *n.* (١) لێدانی هەڵە (یاری بلیارد). (٢) هەڵە.

*v.i.* (١) بە هەڵە لێدان (بلیارد). (٢) بە هەڵە وەڵام دانەوە (شانۆگەری)؛ هەڵەکردن.

**misdeal** (mis-dēl′), *v.t., v.i. & n.* بە هەڵە دابەشکردن (کاغەزی قومارو یاری).

**misdeed** (mis-dēd′), *n.* تاوان؛ کاری خراپ؛ بەدکاری؛ خراپە.

**misdeem** (mis-dēm′), *v.t.* [Archaic or Poetic]. = **misjudge.**

**misdemean** (mis′di-mēn′), *v.i.* بەدڕەفتاری کردن؛ ڕەووشتی ناشرین نوواندن؛ بەدکاری کردن؛ تاوان کردن.

**misdemeanant** (dis′di-mēn′ənt), *n.* (١) تاوانباری بچووك یا مام ناوەندی (دادگا). (٢) بەدڕەفتار؛ بەدڕەووشت؛ بەدکار.

**misdemeanor** (mis′di-mēn′ēr), *n.* (١) تاوانی بچووك (دادگا)؛ تاوان. (٢) [Archaic]، بەدڕەفتاری؛ بەدڕەووشتی.

**misdirect** (mis′də-rekt′, mis′dī-rekt′), *v.t.* (١) ئامۆژگاری هەڵە پێدان؛ بە هەڵەدا بردن؛ بە هەڵە پێ ووتن. (٢) ناونیشانی هەڵە خستنەسەر نامە.

**misdirection** (mis′də-rek′shən, mis′dī-rek′shən), *n.* (١) ئامۆژگاری هەڵە؛ هەڵە؛ بە هەڵەدا بردن. (٢) ئامۆژگاری هەڵە لە دادپرسەوە بۆ سوێندخواران

**misdo** (mis-dōō′), *v.t.* تێکدان؛ بە چەوتی و نەزانانە کردن.

*v.i.* [Obs.], بەدکاری کردن؛ گوناه کردن.

**misdoing** (mis-dōō′iŋ), *n.* بەدکاری؛ کاری خراپ؛ گوناه؛ تاوان؛ هەڵە.

**misdoubt** (mis-dout′), *v.t.* [Archaic], (١) گومان لێکردن؛ گومان لێ بوون. (٢) ترسان؛ مەترسی لێکردن؛ لێ ترسان.

*v.i.* [Archaic], گومان لێ هەبوون

*n.* [Archaic], گومان.

**mise en scène** (mē′ zän′ sen′), [Fr.], (١) دەرهێنانی شانۆنامە؛ نوواندنی شانۆنامە (بە هەڵبژاردنی دەوروبەرەکەی و ڕێکخستنی ئەکتەرەکان و پێویستی ترەوە). (٢) دەوروبەر؛ دەوروپشت.

**miser** (mī′zēr), *n.* (١) کەسێکی ڕەزیل؛ پیسکە؛ پارەپیس؛ پوولەکی. (٢) [Obs.]، کەسێکی کلۆڵ؛ کەساس.

**miserable** (miz′ēr-ə-b'l, miz′rə-b'l), *adj.* (١) دڵتەنگ؛ پەست؛ غەمبار؛ کەساس؛ بەدبەخت؛ هەناسەسارد. (٢) ناخۆش؛ بەد؛ ناپەسەند؛ خراپ: *( a ~ climate)*. (٣) خراپ؛ ناخۆش (خواردن)؛ کەم (ژەمە خواردن). *( a ~ meal)*. (٤) قەڵب؛ خراپ؛ بێ فەڕ: *( He did a ~ job.)*.

-**miserableness** *(n.)*; **miserably** *(adv.)*.

**misericord, misericorde** (miz′ēr-i-kôrd′), *n.* (١) شل کردنی پەیڕەوی پەرستگایەك. (٢) ژووری حەوانەوەی پەرستگا. (٣) بەشێکی دەرپۆقیوی ژێر کورسی کڵێسەیە ڕێگەی حەوانەوە دەدات بە کەسێك کە بە پێوە نوێژ دەکات. (٤) خەنجەری بەزەیی و ڕزگاری (کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سوارچاکی زۆر بریندارو پەرێشانی پێ دەکوژرا بۆ ڕزگارکردنی لە ئازار)

**miserliness** (mī′zēr-li-nis), *n.* ڕەزیلی؛ پیسکەیی؛ پارەپیسی؛ پوولەکێتی؛ بەرچاوتەنگی.

**miserly** (mī′zēr-li), *adj.* ڕەزیل؛ پیسکە؛ پارەپیس؛ پوولەکی؛ چرووك.

**misery** (miz′ēr-i), *n.* (١) مەینەتی؛ کوێرەوەری؛ ناخۆشی؛ کەساسی؛ کلۆڵی؛ دڵتەنگی؛ غەمباری. (٢) هەژاری؛ نەبوونی؛ ناخۆشی. (٣) [Dial.]، ئازار؛ ئێش.

**misesteem** (mis-es′tēm), *v.t.* ڕێزی تەواو لێ نەگرتن.

**misestimate** (mis-es′tə-māt′), *v.t.* بە هەڵە هەڵسەنگاندن؛ بە هەڵە خەمڵاندن.

*n.* هەڵسەنگاندنی هەڵە؛ خەمڵاندنی هەڵە.

**misfeasance** (mis-fē′z'ns), *n.* سنوور شکاندن (کاربەدەست)؛ بەکارهێنانی دەسەڵات بە نابەجێیی؛ بۆ مەبەستی خراپ دەسەڵات بەکارهێنان.

**misfire** (mis-fīr′), *v.i.* (١) دانەگیرسان (مەکینە). (٢) نەتەقین (چەکی ئاگرین)؛ نەتەقان. (٣) سەرنەکەوتن (پیلان)؛ سەرنەگرتن: *( a scheme that ~d)*.

*n.* (١) دانەگیرسان. (٢) نەتەقین. (٣) سەرنەگرتن.

**misfit** (mis-fit′), *v.t. & v.i.* پێ نەکردن (پێڵاو، جل‌وبەرگ)؛ بەبەرنەکردن؛ نەگونجان.

*n.* (١) پێ نەکردن (پێڵاو، جل). (٢) جلی بە بەر نەکردوو؛ پێڵاوی بە پێ نەکردوو. (٣) کەسێکی نەگونجاو لەگەڵ دەوروبەریدا.

**misfortune** (mis-fôr′chən), *n.* (١) بەدبەختی؛ نەهاتی؛ نەگبەتی. (٢) کارەسات؛ بەڵا؛ لێقەومان.

**misgive** (mis-giv′), *v.t. & v.i.* مەترسی کردن؛ بەدگومانی کردن؛ دوودڵ بوون.

**misgiving** (mis-giv′iŋ), *n. often in pl.,* بەدگومانی؛ مەترسی؛ دوودڵی.

**misgovern** (mis-guv′ērn), *v.t.* بە خراپی بەڕێوەبردن.

**misgovernment** (mis-guv′ērn-mənt), *n.* بە خراپی بەڕێوەبردن.

**misguidance** (mis-gīd′əns), *n.* بە هەڵەدا بردن.

**misguide** (mis-gīd′), *v.t.* بە هەڵەدا بردن؛ خستنە سەر ڕێی خراپ.

**misguided** (mis-gīd′id), *adj.* بە هەڵەدا براو؛ هەڵخەڵەتاو.

**mishandle** (mis-han′d'l), *v.t.* بە خراپی کردن یا بەڕێوەبردن؛ بە ناشرینانە لەگەڵ جووڵانەوە؛ بە نەزانانە چارەسەرکردن.

**mishap** (mis′hap′, mis-hap′), *n.* (١) بەدبەختی؛ بێ شانسی. (٢) ڕووداوێکی ناخۆش کە جێی داخەو خەتای کەسیشی تێدا نییە؛ ڕووداوێکی ناپەسەندی تەریقکەرەوە.

**mish-mash** (mish′mash′), *n.* = **hodgepodge.**

**misinform** (mis′in-fôrm′, mis′'n-fôrm′), *v.t. & v.i.* شتی هەڵە یا درۆ پێ ووتن؛ دەنگوباسی هەڵە یا درۆ پێدان؛ بە هەڵەدا بردن

-**misinformant; misinformer** *(n.)*.

**misinformation** (mis′in-fēr-mā′shən), *n.* دەنگوباسی درۆ یا هەڵە کە دەگەیەنرێ بە خەڵك؛ شتی هەڵە یا درۆ.

**misinterpret** (mis′in-tūr′prit), *v.t.* بە هەڵە لێکدانەوە؛ بە هەڵە تێگەیشتن.

**misinterpretation** (mis′in-tūr′pri-tā′shən), *n.* بە هەڵە لێکدانەوە؛ بە هەڵە تێگەیشتن.

**misjudge** (mis-juj′), *v.t. & v.i.* بە هەڵە هەڵسەنگاندن؛ بەهەڵەداچوون.

-**misjudgment; misjudgement** *(n.)*.

**mislay** (mis-lā′), *v.t.* (١) شت دانان لە شوێنێکداو ڕێ پێ نەبردنەوە لە دواییدا؛ لە شوێنێکدا دانان و بۆ نەدۆزرانەوە لە دواییدا. (٢) بە نەزانانە یا بە هەڵە دانان؛ بە خراپی کردن: *( to ~ linoleum)*.

**mislead** (mis-lēd′), *v.t.* بە هەڵەدا بردن؛ هەڵفریواندن؛ خەڵەتاندن؛ چاوبەستکردن؛ لەخشتەبردن.

**misleading** (mis-lēd′iŋ), *adj.* بەهەڵەدابەر؛ درۆ؛ چاوبەستکەر؛
هەڵخەڵەتێنەر؛ تەفرەدەر: ***( ~ information)***
**mismanage** (mis-man′ij), *v.t. & v.i.* بە خراپی بەڕێوەبردن.
**mismanagement** (mis-man′ij-mənt), *n.* بە خراپی
بەڕێوەبردن.
**mismatch** (mis-mach′), *v.t.* (١) یەك پێگرتنی نەگونجاو یا
نەگونجاوان (بەتایبەتی ژنهێنان و شووکردن). (٢) یەکخستنی شتی لەیەك
نەهاتوو یا پێکەوە نەگونجاو (ڕەنگ، جل وبەرگ)
***n.*** یەکگرتنی نەگونجاو یا خراپ (ژنهێنان و شووکردن)؛ یەککەوتنی دوو شت یا
ڕەنگی لەیەك نەهاتوو؛ لاسەنگی؛ ناهاوتایی.
**mismate** (mis-māt′), *v.t. & v.i.* جووت بوونی نەگونجاو؛
ژنهێنان و شووکردنی ناپەسەند
**misname** (mis-nām′), *v.t.* ناوی هەڵە لێنان؛
بە ناوی هەڵە بانگ کردن.
**misnomer** (mis-nō′mėr), *n.* (١) (ا) بە هەڵە ناولێنانی کەسێك،
شوێنێك یا شتێك (کە ناوەکە ڕاستی شتەکە یا شوێنەکە دەرنەخات).
(ب) ناوێکی هەڵەی وەها. (٢) بە هەڵە ناولێنانی کەسێك یا شوێنێك لە
بڕوانامەیەکی یاساییدا.
**miso-** (mis′ō), پێشگرێکە بەمانای: ڕق؛ قین: ***( misogyny)*** .
**misogamist** (mi-sog′ə-mist), *n.* کەسێکە کە ڕقی لە ژنهێنان و
شووکردنە
**misogamy** (mi-sog′ə-mi), *n.* ڕق بوون لە ژنهێنان و شووکردن.
**misogynist** (mi-soj′ə-nist), *n.* کەسێکە کە ڕقی لە هەموو ژنە
(بەتایبەتی پیاو).
**misogyny** (mi-soj′ə-ni), *n.* ڕق بوون لە هەموو ژن؛ ڕق لە ژن بوون.
**-misogynous** ***(adj.).***
**misology** (mi-sol′ə-ji), *n.* ڕق بوون لە مشتومڕ، ژیربێژی، یا
چەندوچوون
**-misologist** ***(n.).***
**misplace** (mis-plās′), *v.t.* (١) لە جێی هەڵەدا دانان؛ لە جێی
خۆیدا دانەنان؛ بە هەڵە دانان لە جێیەکی تردا.
(٢) بە هەڵە بڕوا یا دڵی خۆ دان بە یەکێك کە شایستەی ئەوە نەبێت.
(٣) [Colloq.]، بە هەڵە دانان لە شوێنێکداو ڕێ پێ نەبردنەوە.
**-misplacement** ***(n.).***
**misprint** (mis-print′), *v.t.* بە هەڵە چاپکردن؛
هەڵەکردن لە چاپکردندا.
***n.*** هەڵەی چاپ؛ هەڵەی چاپەمەنی.
**mispronounce** (mis′prə-nouns′), *v.t. & v.i.* بە هەڵە وتن؛
بە هەڵە بێژان.
**-mispronounciation** ***(n.).***
**misquote** (mis-kwōt′), *v.t.* بە بەڵگە یا نموونە هێنانەوەی وتەی
کەسێك یا وتارێك بە هەڵە: ***( to ~ a person or a book)*** .
**-misquotation** ***(n.).***
**misread** (mis-rēd′), *v.t. & v.i.* (١) بە هەڵە خوێندنەوە
(٢) بە هەڵە لێکدانەوە؛ بە هەڵە تێگەیشتن.
**misrepresent** (mis′rep-ri-zent′), *v.t.* (١) بە چەوتی یا
شێواوی خستنە پێش چاو؛ تێکدان؛ شێواندن؛ درۆکردن: ***( to ~ the facts)*** .
(٢) بە چەوتی یا ناپەسەندی نوێنەرایەتی کردن.
**-misrepresentation** ***(n.)***; **misrepresentative** ***(adj.).***
**misrule** (mis-rōōl′), *v.t.* بە خراپی یا ناڕەوایی فەرمانڕەوایی کردن.
***n.*** (١) فەرمانڕەوایی خراپ یا ناڕەوا. (٢) پشێوی؛ بێ ئاسوودەیی؛ ئاشووب.
**miss** (mis), *v.t.* (١) لێ نەدان؛ نەپێکان.
(٢) سەرکەوتوو نەبوون لە دەستکەوتن، بینین، گوێ لێ بوون، یا کردندا.
(٣) پیا ڕانەگەیین ***( I ~ed the train.)***
(٤) لەکیس چوون؛ لەکیس خۆ دان؛ لە دەست چوون؛ لە دەست خۆ دان:
***( to ~ an opportunity)***
(٥) لەوێ نەبوون؛ ئامادەنەبوون: ***( He ~ed class yesterday.)*** .
(٦) دەربازبوون؛ ڕزگاربوون: ***( He just ~ed being struck.)*** .
(٧) پێ زانین بە وون بوون یا دیارنەبوونی شتێك:
***( He suddenly ~ed his watch.)***
(٨) بیرکردن: ***( I ~ you.; she ~ed her friends.)*** .
***v.i.*** (١) بەرنەکەوتن؛ لێ نەدان؛ نەپێکان. (٢) سەرنەکەوتن؛ سەرکەوتوو نەبوون.
***n.*** لێ نەدان؛ بەرنەکەوتن؛ نەپێکان؛ دەست نەکەوتن؛ نەبوون؛ سەرنەگرتن
**miss** (mis), *n.* (١) [M-] ، خان: نازناوی ڕێزە بۆ کچ لە دووان و
نووسیندا لەپێش ناوەکەیەوە دادەنرێ: ***( M~ Smith)*** .
(٢) خانم: نازناوی کچە لە دووان و نووسیندا بەبێ ناوەکەی.
(٣) کچ؛ ئافرەتی شوونەکردوو یا بێ مێرد.
**missal** (mis′'l), *n.* (١) پەڕتووکی نوێژو نزای ساڵێکی تەواو (ئاینی
کاسۆلیکی). (٢) پەڕتووکی نوێژو نزا.
**misshape** (mis-shāp′), *v.t.* شێوە تێکدان؛ ڕووخسار تێکدان؛
ناشرین کردن.
**misshapen** (mis-shāp′'n), *adj.* شێوە تێکدراو؛ ڕووخسار تێکدراو؛
ناشرین.
**missile** (mis′'l), *adj.* (١) دەهاوێژرێ (٢) [Rare] ، هاوێژ.
***n.*** مووشەك؛ فیشەکی هەوایی.
**missilery** (mis′'l-ri), *n.* زانستی مووشەك دروستکردن و هاویشتن؛
مووشەکناسی.
**missing** (mis′iŋ), *adj.* وون بوو؛ وون (بەتایبەتی لەدوای جەنگدا).
**missing link,** (١) ئەڵقەی وون (لە زنجیرەیەکدا کە پێویستە بۆ
تێگەیشتنی). (٢) ئەڵقەی وون (گوایە مەیموون و ئادەمیزاد پێکەوە دەبەستێ).
**mission** (mish′ən), *n.* (١) ناردنی خەڵك بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینێك
(بەتایبەتی لە دەرەوەی وڵات).
(٢) ناردنی نوێنەری دیبلۆماسی بۆ دەرەوە بۆ گفتوگۆ.
(٣) (ا) دەستەیەکی نێردراو بۆ بڵاوکردنەوەی ئاین لە دەرەوەی وڵات.
(ب) بارەگای دەستەیەکی وەها. (٤) باڵیۆزخانە.
(٥) ئەرکی پەیامبەر یا نوێنەر؛ ئەرکی پێ سپێردراو.
(٦) ئەرکی سەرشان؛ ئەرکی چارەنووس:
***( His ~ in life was to educate the ignorant.)***
(٧) ڕێکخراوی کاری خێر یا پەروەردەکردن لە گەڕەکی هەژارەکاندا.
(٨) ناوچەیەکە کە قەشەی تایبەتی خۆی نەبێ.
(٩) (*pl.*)، خاچ پەرستی بڵاوکردنەوە.
(١٠) ئەرکی سوپایی (بەتایبەتی بۆمباران کردن):
***( He flew many ~s in the war.)***
***adj.*** تایبەتی بە کڵێسە کۆنەکانی دەستەی خاچ پەرستانی ئیسپانی لە
خوارووی ڕۆژاوای ئەمەریکادا.
***v.t.*** (١) پەیام پیا ناردن؛ ناردن بە ئەرك؛ ئەرك پێدا ڕاسپاردن.
(٢) ناردن بۆ بڵاوکردنەوەی ئاین.
**missionary** (mish′ən-er′i), *adj.* تایبەتی بە بڵاوکردنەوەی ئاین؛
تایبەتی بە ئاینی خاچ پەرستی بڵاوکەرەوەکان و بارەگاکانیان.
***n.*** ئاین بڵاوکەرەوە لە دەرەوەی وڵات؛
پەیامبەری کڵێسە بۆ ئاین بڵاوکردنەوە لە دەرەوە.
**missioner** (mish′ən-ēr), *n.* = **missionary.**
**missis, missus** (mis′əz), *n.* (١) [Colloq. or Dial.] ، ژن؛
خێزان: ***( The ~ does all the shopping.)*** .
(٢) کەیبانوو؛ ژنی ماڵ.
**missive** (mis′iv), *n.* نامە؛ پەیام.
*adj.* [Archaic or Rare], نێردراو (نامە).
**misspell** (mis-spel′), *v.t. & v.i.* بە هەڵە ڕێنووسکردن.
**misspelling** (mis-spel′iŋ), *n.* هەڵەی ڕێنووس.
**misspend** (mis-spend′), *v.t.* بەفیڕۆدان؛ پارە بەبادان.

**misstate** (mis-stāt′), *v.t.* به هه‌ڵه ده‌ربڕین؛ به هه‌ڵه وتن؛ شێواندن:
*( He ~d the facts.; I ~d myself.)*
**misstatement** (mis-stāt′mənt), *n.* شتی درۆ یا هه‌ڵه؛
وته یا ڕاستی‌یه‌كی به ده‌سه‌نقه‌ست شێوێنراو.
**misstep** (mis-step′), *n.* (١) هه‌نگاوی هه‌ڵه؛ پێ هه‌ڵكه‌وتن.
(٢) هه‌ڵه (ڕه‌وشت)؛ هه‌ڵه‌یه‌كه كه ببێته هۆی ته‌ریق بوونه‌وه.
**missus** (mis′əz), *n.* [Colloq. or Dial.], = **missis.**
**missy** (mis′i), *n.* [Colloq.], خان (نازناوه بۆ كچی بچووك).
**mist** (mist), *n.* (١) ته‌مومژ؛ ته‌می ته‌نك؛ هه‌ڵموهالاو.
(٢) لێڵی به‌رچاوگر؛ لێڵی به‌رچاو: *( She smiled in a ~ of tears.)*.
(٣) لێڵی مێشك؛ لێڵی تێگه‌یشتن.
*v.t. & v.i.* (١) ته‌مومژاوی بوون
(٢) لێڵ كردن؛ به‌رچاوگرتن؛ به‌رگرتن (بینین، تێگه‌یشتن)؛ به‌رچاوگیران.
**mistakable** (mis-tāk′ə-b'l), *adj.* به هه‌ڵه وه‌رده‌گیرێ؛
بۆی هه‌یه به هه‌ڵه وه‌ربگیرێ یا لێك بدرێته‌وه.
**mistake** (mis-tāk′), *v.t.* (١) به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه لێكدانه‌وه؛
خراپ تێگه‌یشتن: *( You ~ his real motives.)*.
(٢) كه‌سێك به كه‌سێكی تر دانان یا زانین؛ شتێك به شتێكی تر دانان؛
نه‌ناسینه‌وه: *( I mistook him for his brother.)*.
*v.i.* هه‌ڵه‌كردن؛ به‌هه‌ڵه‌داچوون.
*n.* هه‌ڵه؛ چه‌وتی
**and no mistake,** [Colloq.], بێ گومان.
**by mistake,** به هه‌ڵه: *( I took your umbrella by mistake.)*.
**mistaken** (mis-tak′'n), *adj.* (١) به‌هه‌ڵه‌داچوو؛ به هه‌ڵه تێگه‌یشتوو.
(٢) هه‌ڵه؛ چه‌وت.
**mister** (mis′tēr), *n.* (١) [M-]، نازناوی ڕێزه بۆ پیاو وه‌ك " كاك "
له‌پێش ناوی پیاوه‌كه‌وه داده‌نرێ له دووان و نووسیندا به كورتی و به‌م جۆره:
" **Mr.** "؛ به‌ڕێز؛ ئه‌فه‌ندی:
*( Mr. Jones; Mr. Secretary; Mr. Minister)*
(٢) نازناوی بانگ كردنه بۆ هه‌ندێ پله‌ی سوپای ئه‌مه‌ریكی.
(٣) [Colloq.]، كاكه، خاڵه: بۆ بانگ كردنی كه‌سێكه ناوه‌كه‌ی نه‌زانێت:
*( What time is it, ~ ?)*
(٤) مێرد
**mistletoe** (mis′'l-tō′), *n.* ده‌مووكانه: ڕووه‌كێكی لاكوتی هه‌میشه
سه‌وزه.
**mistook** (mis-took′), *past tense and obsolete p.p of* **mistake.**
**mistranslate** (mis′trans-lāt′, mis-tranz′lāt), *v.t.* به هه‌ڵه
وه‌رگێڕان (زمان).
**-mistranslation** *(n.).*
**mistreat** (mis-trēt′), *v.t.* به خراپی له‌گه‌ڵ جووڵانه‌وه.
**-mistreatment** *(n.).*
**mistress** (mis′tris), *n.* (١) كه‌یبانوو؛ گه‌وره‌ژنی ماڵ؛ ژنی ماڵ:
*( the ~ of a household)*
(٢) خاوه‌ن گیاندار یا به‌نده
(٣) خانم؛ ژنی ده‌سه‌ڵاتدار: *( the ~ of his heart)*.
(٤) [M-]. شتێكی به‌ده‌سه‌ڵاتی به مێ دانراو؛ خانم (مه‌جاز):
*( England was M~ of the sea.)*
(٥) ژنێكی لێهاتوو له مه‌یدانێكدا: *( a ~ of cooking)*.
(٦) دۆست؛ هارجێ
(٧) [British]، ژنه مامۆستا.
(٨) [Archaic]، دلدار؛ یار.
(٩) [M-]. نازناوی ڕێزه بۆ ئافره‌ت. (ئێستا " **Mrs.** "، " **Miss** "، یا
" **Ms.** " به‌كارده‌هێنرێ).
**mistrial** (mis-trī′əl), *n.* دادپرسی پووچ؛ داواكاری پووچ كراوه
به‌هۆی هه‌ڵه‌یه‌ك له چۆنێتی دادپرسینه‌كه‌دا یا ڕێك نه‌كه‌وتنی سوێندخۆره‌كان
له‌سه‌ر بڕیارێك).
**mistrust** (mis-trust′), *n.* بڕوا پێ نه‌بوون؛ گومان؛ بێ باوه‌ڕی.
*v.t. & v.i.* بڕوا پێ نه‌كردن (مرۆڤ، شت، ڕێبازن)؛ بڕوا پێ نه‌بوون؛
دڵ لێ پیس بوون؛ گومان لێ بوون.
**mistrustful** (mis-trust′fəl), *adj.* بێ بڕوا؛ دڵ پیس؛ به‌گومان.
**misty** (mis′ti), *adj.* (١) ته‌مومژاوی؛ ته‌ماوی؛ له ته‌مومژ چوو.
(٢) به ته‌مومژ داپۆشراو. (٣) لێڵ؛ ناڕوون؛ نادیار.
-mistiness *(n.).*
**misunderstand** (mis′un-dēr-stand′), *v.t.* به هه‌ڵه تێگه‌یشتن؛
خراپ تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه لێكدانه‌وه؛ به هه‌ڵه وه‌رگرتن.
**misunderstanding** (mis′un-dēr-stan′diŋ), *n.* (١) به هه‌ڵه
تێگه‌یشتن؛ به هه‌ڵه وه‌رگرتن. (٢) ناكۆكی؛ گیروگرفت؛ ده‌مه‌قاڵێ؛ ناخۆشی.
**misunderstood** (mis′un-dēr-stood′), *adj.* (١) به هه‌ڵه
وه‌رگیراو؛ به هه‌ڵه لێكدراوه. (٢) گوێ پێ نه‌دراو؛ بایه‌خ پێ نه‌دراو؛
ڕێز لێ نه‌گیراو: *( a ~ child)*.
**misusage** (mis-ūs′ij, mis-ūz′ij), *n.* (١) به هه‌ڵه به‌كارهێنان
ووشه). (٢) به خراپی یا توندوتیژی له‌گه‌ڵ جووڵانه‌وه.
**misuse** (mis-ūz′), *v.t.* (١) به هه‌ڵه به‌كارهێنان (ووشه).
(٢) به خراپی، ناشرینی، یا توندوتیژی له‌گه‌ڵ جووڵانه‌وه.
*n.* ١) به هه‌ڵه به‌كارهێنان (ووشه).
(٢) [Obs. or Rare]، به خراپی یا توندوتیژی له‌گه‌ڵ جووڵانه‌وه.
**misvalue** (mis-val′ū), *v.t.* به هه‌ڵه هه‌ڵسه‌نگاندن؛
به‌ته‌واوی بایه‌خ پێ نه‌دان.
**misventure** (mis-ven′chēr), *n.* = **misadventure.**
**misword** (mis-wūrd′), *v.t.* به ووشه‌ی هه‌ڵه ده‌ربڕین؛
به هه‌ڵه داڕشتن.
**mite** (mīt), *n.* مۆرانه؛ جانه‌وه‌رێكی مشه‌خۆری زۆر بچووكه.
**mite** (mīt), *n.* (١) (ا) بڕێكی زۆر كه‌م پاره. (ب) پاره‌یه‌كی زۆر بێ نرخه له
ئینگلته‌ره؛ فلس. (٢) زینده‌وه‌رێك یا شتێكی زۆر بچووك.
**miter, mitre** (mī′tēr), *n.* (١) كڵاوی ڕازاوه‌ی پاپا و سه‌ره‌ك قه‌شه؛
تاجی پاپا و سه‌ره‌ك قه‌شه. (٢) (ا) كڵاوی كۆنی سه‌ره‌ك مالووم.
(ب) سه‌رپێچی ژنانه‌ی یۆنانی كۆن. (٣) پله‌وپایه‌ی سه‌ره‌ك قه‌شه.
(٤) كڵاوه‌ی لووله‌ی زۆپا و دووكه‌ڵكێش.
*v.t.* كردن به سه‌ره‌ك قه‌شه؛ تاجی سه‌ره‌ك قه‌شه كردنه سه‌ر.
**miter, mitre** (mī′tēr), *n.* (١) جێی لێكدانی دوو ته‌خته‌دار به
گۆشه‌ی (٤٥ پله) بۆ پێكهێنانی گۆشه‌ی (٩٠ پله).
(هه‌روه‌ها " **miter joint** ").
(٢) هه‌ریه‌كه له ڕووی ئه‌م دوو پارچه ته‌خته‌یه.
**miter box,** ئامێرێكه بۆ یارمه‌تیدان له بڕینی ته‌خته‌دار بۆ لێكدانیان و
گۆشه‌ی ڕاست دروستكردن.
**mithridate** (mith′rə-dāt′), *n.* ده‌رمانی دژی ژه‌هر.
**mitigable** (mit′i-gə-b'l), *adj.* كه‌م ده‌كرێته‌وه (ووشه‌ی داهاتوو
ببینه).
**mitigate** (mit′ə-gāt′), *v.t.* كه‌مكردنه‌وه (تووڕه‌یی، ئازار، سزا، خه‌م،
توندوتیژی، زیان، گه‌رما، سه‌رما)؛ نه‌رم كردن (مه‌جاز)؛ خاوكردنه‌وه:
*( to ~ someone's anger, pain, loss, aggressiveness, etc.)*
**-mitigation** *(n.)*; **mitigative; mitigatory** *(adj.)*;
**mitigator** *(n.).*
**mitosis** (mi-tō′sis, mī-tō′sis), *n.* كه‌رت كه‌رت بوون؛ دابه‌شبوونی
ناڕاسته‌وخۆ (له خانه‌ی له‌شی گیانداره باڵاكاندا)؛ دابه‌شبوونی ده‌نووله‌یی.
**-mitotic** *(adj.)*; **mitotically** *(adv.).*
**mitral** (mī′trəl), *adj.* (١) هی كڵاوی ڕازاوه‌ی سه‌ره‌ك قه‌شه.
(٢) هی زمانه‌ی دڵ
**mitral valve,** زمانه‌ی دڵ؛ زمانه‌ی كڵاوه‌یی دڵ (توێكاری).

**mitre** (mī′tẽr), *n. & v.t.* = miter.

**mitt** (mit), *n.* (١) دەستکێشێکی ژنانەیە باسکو دەستو نەختێك لە پەنجەکان دادەپۆشێ. (٢) mitten . (٣) [Slang]؛ دەست.
(٤) (ئ) دەستکێشی یاریکەری بەیسبۆل.
(ب) دەستکێشی بۆکسبان.

**mitten** (mit′'n), *n.* (١) دەستکێشێکە شوێنی پەنجەگەورەی بە جیایەو چوار پەنجەکەی تریش پێکەوە (٢) دەستکێشێکی ژنانەیە باسکو دەستو نەختێك لە پەنجەکان دادەپۆشێ. (٣) دەستکێشی بۆکسبان.

**mittimus** (mit′i-məs), *n.* (١) فەرمانی خستنە بەندیخانەوە (دادگەری). (٢) دەرکردن لە کار.

**mitzvah** (mits′vä, mits′vō), *n.* (١) فەرمانی ئینجیل یا مالووم. (٢) جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە.

**mix** (miks), *v.t.* (١) تێکەڵاوکردن؛ تێکەڵ کردن.
(٢) دروستکردن لەرێی تێکەڵاوکردنەوە.
(٣) تێکەڵاوکردن؛ یەکخستن:
*( They ~ed the boys and the girls in our school.)*
(٤) جووت پێگرتنی دوو توخم (گیانەوەرناسی، رووەکناسی)؛ لێکدانی دوو توخم.

*v.i.* (١) تێکەڵاوبوون؛ تێکەڵ بوون.
(٢) لەگەڵ خەڵکدا باش هەڵ کردن یا گونجان.

*n.* (١) تێکەڵاوی؛ تێکەڵی؛ تێکەڵ بوون. (٢) شێواوی؛ سەر لێ شێوان؛ پشێوی.
(٣) ئاوێتە؛ چەند شتێکی تێکەڵاوکراو.
(٤) خواردنەوەیەکی گازاوییە (وەك سۆدا) لەگەڵ خواردنەوەیەکی کحولیدا تێکەڵ دەکرێ.

**mix up,** (١) بەتەواوی تێکەڵ کردن؛ باش تێکەڵاوکردن.
(٢) (ئ) سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان؛ تێکدان؛ شێواندن.
(ب) (~ with) بە یەکێکی تر زانین؛ نەناسینەوە؛ بە یەکێکی تر دانان.
(٣) تووش کردن؛ تێوەگلاندن.

**mixed** (mikst), *adj.* (١) تێکەڵاو؛ تێکەڵ؛ ئاوێتە.
(٢) هەمەجەشن؛ جۆرەها؛ تێکەڵاو: *( ~ emotions)* .
(٣) هی نێرومێ؛ هی ژن و پیاو یا کورو کچ: *( a ~ class; ~ company)* .
(٤) شێواو؛ سەر لێ شێواو؛ سەر لێ تێکچوو.

**mixed marriage,** ژنهێنان و شووکردن لەنێوان خەڵکی ئاین یا رەگەز جیاوازدا.

**mixed metaphor,** دوو ووتەی مەجازی نەگونجاو یا زیاتر:
*( The storm of protest was nipped in the bud.)*

**mixed number,** ژمارەی ناتەواو؛ ژمارەی کەرتی.

**mixer** (mik′sẽr), *n.* (١) کەسێك وە جۆنێتی گونجانی لەگەڵ خەڵکدا:
*( He is a good ~ . ; She is a bad ~ .)*
(٢) تێکەڵکەرە؛ ئامێری خواردەمەنی تێکەڵاوکردن یا شڵەقاندن (چێشت لێنان).
(٣) [Slang]؛ ئاهەنگی بەیەکتریناسینی خەڵك.

**mixt** (mikst), *alternative past tense and p.p of* mix.

**mixture** (miks′chẽr), *n.* (١) تێکەڵاوبوون؛ تێکەڵ بوون؛ تێکەڵاوکران.
(٢) شتی تێکەڵاو؛ هەرەمە؛ هەمەرەنگ. (٣) ئاوێتە (کیمیا).

**mix-up** (miks′up′), *n.* (١) شێواوی؛ سەر لێ شێواوی؛ ئاڵۆزی:
*( There was a ~ about who was to meet the train.)*
(٢) [Colloq.]؛ شەڕ؛ بەیەکدادان؛ بەیەکداهاتن؛ بەگژیەکداچوون.

**mizzen, mizen** (miz′'n), *n.* (١) بابەوانی سەر تەوەری پشتەوەی کەشتی. (٢) mizzenmast .

*adj.* تایبەتی بە تەوەری پشتەوەی کەشتی.

**mizzenmast, mizenmast** (miz′'n-məst, miz′'n-mast′), *n.* تەوەری پشتەوەی کەشتی.

**mizzle** (miz′'l), *v.t. & v.i.* تەپ ونم کردن؛ نەرمەباران بارین.
*n.* [Obs. or Dial.], = drizzle.

**mnemonic** (ni-mon′ik), *adj.* (١) یارمەتیدەری یاد؛ بۆ لەبیربوون باشە. (٢) تایبەتی بە یاد یا بیر تیژکردنەوە.

**mnemonics** (ni-mon′iks), *n.pl.* (١) زانستی یاد یا بیر تیژکردنەوە؛ یاد بەهێزکردن. (٢) هۆی یاد یا بیر تیژکردنەوە؛ هۆی بیر بەهێزکردن.

**moa** (mō′ə), *n.* جۆرە باڵندەیەکی گەورەی نەفری قڕتێکەوتووی نیوزیلەندییە لە توخمی وشترمەل

**moan** (mōn), *n.* (١) [Rare] . نووزەنووز؛ نووزە؛ سکاڵا.
(٢) ناڵە؛ ناڵەناڵ؛ نرکە؛ نکەنك.
(٣) دەنگێکی لە ناڵە چوو (وەك لوورەلووری با): *( the ~ of the wind)*

*v.i.* (١) ناڵاندن؛ نرکاندن؛ نکەنك هاتن.
(٢) نووزەنووزکردن؛ سکاڵاکردن؛ کرووزانەوە؛ شین کردن.

*v.t.* (١) بۆ ناڵاندن؛ ئاهوناڵەکردن.
(٢) شین بۆ کردن؛ بۆ کرووزانەوە؛ سکاڵالێکردن: *( He ~ed his fate.)* .

**moat** (mōt), *n.* خەندەقێکی پانو قووڵی پڕ لە ئاوە بەدەوری قەڵایەکدا (بۆ پاراستن لە هێرشی دوژمن).

*v.t.* دەوردان بە خەندەقێکی پانو قووڵی پڕ لە ئاو.

**mob** (mob), *n.* (١) جەماوەرێکی سەرکێشی لاساری گێرەشێوێن؛ کۆمەڵێك خەڵکی ئاشووبگێڕ. (٢) جەماوەر؛ خەڵك.
(٣) رووتەوپووتە؛ بۆرەپیاوان؛ هەرچیوپەرچی.
(٤) [Slang]؛ دەستەیەکی تاوانکار؛ تاقمێکی پیاوخراپ یا پیاوکوژ.

*v.t.* (١) بە کۆمەڵ دەوردان و پەلاماردان.
(٢) بە کۆمەڵ دەورەدانو پاڵ پێوەنانو هەوڵی بینین یا لێ نزیك بوونەوە دان (وەك جەماوەرێك بۆ یەکێکی بەناوبانگ):
*( The audience ~bed the movie star.)*

**mobbish** (mob′ish), *adj.* وەك جەماوەرێکی سەرکێشو لاسار.

**mobile** (mō′b'l), *adj.* (١) جووڵاو؛ بزۆك؛ دەجووڵێنرێ؛ دەگوێزرێتەوە.
(٢) زوو زوو لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێ.
(٣) هەمیشە لە جموجووڵدایە؛ تێکەڵاوی لەنێوان رەگەزو چینو ناوچەکانیدا زۆرە: *( a ~ society)*
(٤) رەوان (شلە)؛ بزۆك: *( a ~ fluid)* .
(٥) گەڕۆك (سوپا)؛ بەئاسانی دەکەوێتە جموجووڵ؛ بزۆك:
*( a ~ unit of the army)*

*n.* پەیکەری بزۆك.

**mobile home,** خانووی بزۆك؛ خانوویەکە دەتوانرێ بگوێزرێتەوە یا بجووڵێنرێ.

**mobility** (mō-bil′ə-ti), *n.* ئاسانی گواستنەوە یا جووڵاندن؛ ئاسانی هاتوچۆ؛ جموجووڵ؛ بزوان.

**mobilization** (mō′b'l-ī-zā′shən), *n.* (١) رەشبگیر؛ لەشکرکردن؛ سەربازگرتنی گشتی. (٢) ئامادەکردن بۆ ئەرکێکی گرنگ؛ ئامادەبوون بۆ کارێکی قورسو گرنگ.

**mobilize** (mō′b'l-īz′), *v.t.* (١) (ئ) بزۆك کردن؛ واڵێکردن کە ببزوێ یا بجووڵێنرێ. (ب) بزواندن؛ خستنە جموجووڵ؛ جووڵاندن.
(٢) رەشبگیرکردن؛ لەشکرکردن؛ ئامادەکردن بۆ جەنگ: *( to ~ the army)*
(٣) ئامادەکردن بۆ کارێکی زۆر گرنگ:
*( We have to ~ all our resources to fight this disease.)*

**mobocracy** (mob-ok′rə-si), *n.* فەرمانڕەوایی رووتەوپووتە؛ حوکمڕانی بۆرەپیاوانی سەرکێشو لاسار.
-mobocrat *(n.)*; mobocratic *(adj.)*.

**mobster** (mob′stẽr), *n.* [Slang], ئەندامی دەستەی تاوانکار یا پیاوخراپ؛ تاوانکار.

**moccasin** (mok′ə-s'n), *n.* (١) نەعلی چەرم؛ نەعل.
(٢) جۆرە مارێکی ژەهراوییە.

**Mocha** (mō′kə), *n.* (١) جۆرە قاوەیەکی وولاتی " یەمەن " ە.
(٢) [m-]، [Colloq.]؛ قاوە؛ هەموو جۆرە قاوەیەك.
(٣) [m-]، جۆرە چەرمێکی نەرمە بۆ دەستکێش.

**mock** (mok), *v.t.* (١) گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین؛ لاقرتێ پێکردن.

(۲) دەمەلاسکێ کردن؛ لاساییکردنەوە (بۆ گاڵتەپێکردن).
(۳) بە هەڵەدابردن؛ هەڵفریواندن؛ تەفرەدان.
(٤) بەرهەڵستی کردن؛ بەزاندن.
*v.i.* ( ~ at ), پێ پێکەنین؛ گاڵتەپێکردن؛ لاقرتێ کردن.
*n.* (۱) لاقرتێ؛ گاڵتەپێکردن. (۲) کەسێکی لاقرتێ هەڵگر؛ شتێکی گاڵتەپێکراو.
(۲) ساختە؛ درۆزنە؛ لاسایی.
*adj.* درۆینە؛ هی لاسایی نەك ڕاستەقینە: *( a ~ trial)* .

**mockery** (mok′ẽr-i), *n.* (۱) گاڵتەپێکردن؛ لاقرتێ پێکردن؛ گاڵتەکاری؛ لاقرتێ. (۲) کەسێك یا شتێکی گاڵتەپێکراو؛ کەسێك یا شتێك کە شایستەی لاقرتێ پێکردن بێت. (۳) لاسایی (بۆ گاڵتەپێکردن)؛ دەمەلاسکێ.
(٤) هەوڵی بێ ئەنجام؛ تەقەلای بێ سوود؛ بێ سوودی.

**mockingbird** (mok′iŋ-bũrd′), *n.* باڵندەی لاساییکەرەوە
باڵندەیەکی بچووکە لاسایی خوێندنی باڵندەی تر دەکاتەوە.

**mock orange,** پرتەقاڵە درۆزنە. دارو دەوەنێکە گوڵو بەرەکەی لە هی دارپرتەقاڵ دەچێ

**mock-up** (mok′up′), *n.* نموونەیەکە بە ئەندازەی سرووشتی یا ڕاستەقینەیی (بۆ لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوە).

**modal** (mō′d'l), *adj.* (۱) تایبەتی بە باری کردار (ڕێزمان): *( a ~ verb)*
(۲) مەرجی (ژیربێژی)
(۳) شێوازی؛ شێوەیی؛ چۆنێتی؛ هی شێوە نەك ناوەڕۆك
(٤) نموونەیی (ژمێرەکاری).

**modal auxiliary,** کردارێکی یاریدەدەرە لەگەڵ کرداری تردا بەکاردەهێنرێ و باری ئەو کردارە پیشان دەدات.
(وەك: can, may, might, must, would, etc. )

**modality** (mō-dal′ə-ti), *n.* مەرجێتی (ژیربێژی)

**mode** (mōd), *n.* (۱) شێوەی کردنی کارێك؛ چۆنێتی؛ شێواز؛ جۆر.
(۲) مۆدە؛ شێوەی باو (۳) باری کردار (ڕێزمان)
(٤) شێوەی شتێك نەك ناوەڕۆکەکەی.
(٥) ژمارەی نموونەیی (ژمێرەکاری).

**model** (mod′'l), *n.* (۱) (ا) وێنە؛ وێنەی دەقاودەق. (ب) سەرمەشق.
(ج) قاڵب (پەیکەرکاری)؛ نەخشە.
(۲) نموونەی باشی؛ نموونە: *( a ~ of good behavior)* .
(۳) مۆدێل *( last year's ~ of automobile)* .
(٤) مۆدێل (ا) کەسێکە پۆز لێدەدات بۆ وێنەگر یا نیگارکێش بۆ وێنەگرتنی (بەتایبەتی ئافرەت)
(ب) نوێنەری جل‌وبەرگی تازە لە پیشانگادا بەتایبەتی ئافرەت.
*adj.* نموونە؛ نموونەیی؛ وێنە
*v.t.* (۱) (ا) قاڵب یا وێنەی نموونەیی دروستکردن.
(ب) لەسەر قاڵبێك یا نموونەیەك دروستکردن.
(۲) کردن بە نموونە بۆ خۆ؛ لەسەر ڕێ‌وشوێن یا ڕەفتاری کەسێك ڕۆیشتن: *( He ~ed his behavior on that of his father.)*
(۳) جل‌وبەرگی مۆدە لەبەرکردن و نواندن لە پیشانگادا
*v.i.* (۱) وێنەی نموونەیی دروستکردن؛ قاڵب دروستکردن
(۲) (ا) پۆزلێدان بۆ وێنەگر یا نیگارکێش بۆ وێنەگرتن.
(ب) جل‌وبەرگی مۆدە لەبەرکردن و نواندنی لە پیشانگادا
-modeler; modeller *(n.)*.

**modeling, modelling** (mod′'l-iŋ, mod′liŋ), *n.* (۱) قاڵب دروستکردن؛ نموونەی وەك قاڵب دروستکردن.
(۲) شێوە (بەتایبەتی هی دەم‌وچاو)؛ ڕووخسار.
(۳) (ا) پۆزلێدان بۆ وێنەگر یا نیگارکێش.
(ب) جل‌وبەرگی مۆدە لەبەرکردن و نواندنی لە پیشانگادا.

**moderate** (mod′ẽr-it), *adj.* (۱) ناوەندی؛ بەئەندازە؛ ناتوندوتیژ؛ نێوانڕەو: *( ~ demands, views, opinions, etc.; a ~ organization, man, etc.)*
(۲) نە زۆرو نە کەم؛ ناوەندی: *( ~ prices)* .
(۳) فێنك؛ نە گەرم و نە سارد: *( a ~ climate)* .
(٤) مام ناوەندی؛ نە باش و نە خراپ: *( a man of ~ skills)* .
*n.* کەسێکی میانڕەو (لەڕووی ڕامیاری و ئاینییەوە).
*v.t.* (۱) جڵەوگرتن؛ هێمن کردنەوە (بیروڕا)؛ خاوکردنەوە؛ لە توندوتیژی کەمکردنەوە: *( He has ~d his political views.)* .
(۲) گێڕان (کۆڕ): *( Who will ~ this meeting?)* .
*v.i.* (۱) هێمن بوونەوە؛ خاوبوونەوە؛ لە توندوتیژی کەم بوونەوە.
(۲) کۆڕ گێڕان.

**moderately** (mod′ẽr-it-li), *adv.* بەئەندازە؛ نەختێك؛ تا ڕادەیەك.

**moderation** (mod′ə-rā′shən), *n.* (۱) جڵەوگیری؛ هێمن کردنەوە؛ لە توندوتیژی کەمکردنەوە. (۲) مام ناوەندێتی؛ نە زۆرو نە کەمی؛ بەئەندازەیی. (۳) نێوانڕۆیی؛ هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ ناتوندوتیژی (لەڕووی ڕامیاری و ئاینییەوە).
**in moderation,** بەئەندازە؛ نە زۆرو نە کەم؛ بە شێوەیەکی مام ناوەندی.

**moderator** (mod′ə-rā′tẽr), *n.* کۆڕگێڕ.

**modern** (mod′ẽrn), *adj.* (۱) تازە؛ نوێ.
(۲) تازەباو؛ نوێ باو؛ تازە داهاتوو. (۳) [M-]، تایبەتی بە زمان یا شێوەی زمانی ئێستا بەکارهێنراو نەك هی کۆن.
*n.* (۱) کەسێکی ئەم چەرخە. (۲) کەسێکی بیروباوەڕ تازەباو؛ نوێخواز.
-modernly *(adv.)*; modernity *(n.)*.

**Modern English,** زمانی ئینگلیزی نوێ (لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە تا ئەمڕۆ).

**modernism** (mod′ẽrn-iz'm), *n.* (۱) (ا) تازەباوی (بەکارهێنانی ووشە، بیروڕا)؛ تازەباوپەرستی. (ب) ووشەیەك، نەریتێك، یا بیروڕایەکی تازەباو. (۲) [M-]، تازەباوکردنی خاچ پەرستی بەگوێرەی زانست (کە بە کفر دادەنرێ). (۳) هونەرکاری تازەباو.
-modernist *(n.)*; modernistic *(adj.)*.

**modernization** (mod′ẽrn-i-zā′shən), *n.* تازەکردنەوە؛ تازەکاری؛ تازەباوکاری؛ تازەباوکردنەوە.

**modernize** (mod′ẽrn-īz′), *v.t. & v.i.* تازەکردنەوە (بۆ گونجاندن لەگەڵ چەرخی تازەدا)؛ تازەباوکردن.

**modest** (mod′ist), *adj.* (۱) بێ فیز؛ بێ هەوا؛ خاکی؛ سادە.
(۲) شەرمن؛ بەحەیاو بەشەرم؛ بە حەیا: *( ~ behavior)* .
(۳) (ا) نێوانڕۆ؛ بەئەندازە: *( a ~ request)* .
(ب) کەم؛ نە زۆرو نە کەم: *( a ~ salary; ~ wages)* .
(٤) سادە؛ ساکار؛ مام ناوەندی؛ نە باش و نە خراپ: *( a ~ home)* .

**modesty** (mod′is-ti), *n.* (۱) بێ فیزی؛ بێ هەوایی؛ سادەیی؛ خاکێتی؛ خۆهەڵنەکێشان. (۲) نێوانڕۆیی؛ بەئەندازەیی؛ نە کەم و نە زۆری
(۳) پەردەی شەرم؛ حەیا؛ شەرم؛ حەیاو شەرم.

**modicum** (mod′i-kəm), *n.* نەختێك؛ تۆزێك.

**modifiable** (mod′ə-fī′ə-b'l), *adj.* دەتوانرێ بگۆڕدرێ.

**modification** (mod′ə-fi-kā′shən), *n.* (۱) گۆڕین؛ گۆڕینێکی کەم؛ سازاندن. (۲) ئەنجامی گۆڕینێکی کەمی وەها.
(۳) نەختێك کەمکردنەوە؛ کەمکردنەوە؛ هێنانە خوارەوە.
(٤) مانا گۆڕین یا ڕوونکردنەوە (وەك ناوەڵناو و ناوەڵکردار) (ووشەی دوای ئەمەو ژمارە سێ ی دووهەم ووشەی دوای ئەمە ببینە).

**modifier** (mod′ə-fī′ẽr), *n.* ووشە یا دەستە ووشەی ماناگۆڕ یا ڕوونکەرەوە: *( Adjectives and adverbs are ~s.)* .

**modify** (mod′ə-fī′), *v.t.* (۱) گۆڕین؛ نەختێك گۆڕین؛ سازکردن: *( to ~ one's behavior, views, a contract, etc.)*
(۲) نەختێك کەمکردنەوە؛ کەمکردنەوە.
(۳) گۆڕین یا ڕوونکردنەوەی مانای ڕستەیەك (ڕێزمان): *( "Large" ~ies "house" in " a large house" . )*

**modish** (mōd′ish), *adj.* مۆدە؛ بەپێی مۆدەی تازەیە؛ مۆدەپەرست؛
تازەباو؛ تازەبەوخواز؛ مۆدەی تازە پەرست.

**modiste** (mō-dēst′), *n.* بەرگدرووی مۆدەی ژنانە؛
فرۆشیارو نەخشەکێشی بەرگی تازەباوی ژنانە.

**modulate** (moj′oo-lāt′), *v.t.* (١) ڕێك وپێك کردن؛ ڕێکخستن؛
گونجاندن. (٢) بەرزو نزم کردنەوەی دەنگ.
(٣) گۆرانی ووتن؛ خوێندنەوە وەك بە گۆرانی؛ خوێندن (سروود).
(٤) گۆڕینی ئاوازی مۆسیقا.
(٥) گۆڕینی مەوداو لەرەی شەپۆلی رادیۆ

*v.i.* (١) گۆڕ نی ئاوازی مۆسیقا (٢) گۆڕانی مەوداو لەرەی شەپۆلی رادیۆ.

**modulation** (moj′oo-lā′shən), *n.* (١) بەرزونزمی دەنگ
(٢) گۆڕینی ئاوازی مۆسیقا (٣) گۆڕینی لەرەو مەودای شەپۆلی رادیۆ.
(٤) نەمانی هێزی سەر ووشەو کورت بوونەوەی (ووشەی " have " لەم دوو
ڕستەیەد بەراورد بکە: *( I've gone.; I have friends.)*.

**modulator** (moj′oo-lā′tēr), *n.* (١) ڕێك وپێککەر؛ گونجێنەر
(٢) ئامێری گۆڕینی لەرەو مەودای شەپۆلی رادیۆ.
(٣) هەستەدەمارێکی تۆڕی چاوە.

**module** (moj′ōōl. moj′ul), *n.* (١) جۆرە پێوانەیەکە (بۆ ئاوی
ڕۆییو؛ (٢) پێوانەیەکە دەکرێ بە ئەندازە بۆ لێکدانەوەی هەموو ئەندازەیەکی
خانوویەك (وەك تیرەی کۆڵەکە) (٣) ئامێرێکی ئەلەکترۆنی‌یە کە بەشێکە لە
ئامێرێکی گەورەتر. (٤) بەشێکە لە کەشتی هەوایی.

-modular *(adj.)*.

**modulus** (moj′oo-ləs), *n.* (١) ئەندازە؛ نموونە.
(٢) ژمارەی بەسەردا دابەشکراو. (٣) مەودا

**modus operandi,** [L.]. شێوەی کارکردن؛ شێوەی کار جێبەجێکردن؛
شێوەی ڕەفتارنوواندن؛ شێوەی کاروبار بەڕێوەبردن.

**modus vivendi,** [L.], (١) شێوەی ژیان؛ چۆنێتی ژیان.
(٢) ڕێکەوتنێکی سەردەمی

**mofette, moffette** (mō-fet′), *n.* (١) کونێکە دووەم ئۆکسیدی
کاربۆن و گازی تری لەژێر زەوی‌یەوە لێ دێتە دەرەوە (دوای ئاگرپژێن).
(٢) ئەو گازانەی لە کونێکی وەهاوە لەژێر زەوی‌یەوە دێنە دەرەوە.

**Mogul** (mō′gul, mō-gul′), *n.* (١) مەغۆل؛ مەغۆلی.
(٢) [m-] کەسێکی گەورەو بەدەسەلات؛ کەسێکی گرنگ.
(٣) [m-] مەکینەیەکی هەڵمە بۆ ڕاکێشانی شەمەندەفەری قورس.

**mohair** (mō′hâr′), *n.* (١) مەرەز؛ کارەموو. (٢) قوماشی مەرەز.
(٣) جل وبەرگی مەرەز.

**Mohammedan** (mō-ham′ə-dən), *adj.* تایبەتی بە ئیسلام؛
تایبەتی بە پێغەمبەر. (هەروەها " Muhammadan ").

*n.* موسوڵمان؛ موسوڵمانێك.

**Mohammedanism** (mō-ham′ə-dən-iz′m), *n.* ئیسلام؛
ئاینی ئیسلام (هەروەها " Muhammadanism ").

**Mohawk** (mō′hôk), *n.* (١) خێڵێکی هیندی سووری ئەمەریکایی‌یە.
(٢) ئەندامێکی ئەم خێڵە. (٣) زمانی ئەم خێڵە.

*adj.* تایبەتی ئەم خێڵە

**moiety** (moi′ə-ti), *n.* (١) نیو؛ نیوە (٢) هەند؛ بەش؛ بڕ

**moil** (moil), *v.i.* ئارەق ڕشتن؛ ئیشی قورس و ناخۆش کردن.

*n.* (١) ئیشی قورس و ناخۆش (٢) پشێوی؛ شێواوی.

**moist** (moist), *adj.* شێدار؛ تەڕ.

**moisten** (mois′'n), *v.t. & v.i.* تەڕکردن؛ تەڕبوون؛ شێداربوون

**moisture** (mois′chēr), *n.* شێ؛ شێداری؛ تەڕی.

**moke** (mōk), *n.* [Slang]. (١) قولەڕەش (لەڕووی سووکی‌یەوە)
(٢) کەر؛ گوێ درێژ (٣) کەسێکی کەرو بێ مێشك
(٤) ئەسپێکی پیری پەککەوتە.

**molar** (mō′lēr), *adj.* (١) هاڕەر شتی پێ دەهاڕێ (٢) کاکیلەیی

*n.* کاکیلە؛ خڕی

**molar** (mō′lēr), *adj.* هی پارچەیەك هەمووی نەك گەردەکانی (فیزیا).

**molasses** (mə-las′iz), *n.* دۆشاو.

**mold, mould** (mōld), *n.* (١) قاڵب؛ چوارچێوە. (٢) مۆدێل.
(٣) شتێکی بە قاڵب دروستکراو؛ شتێکی لە قاڵب دراو. (٤) شێوە.
(٥) سرووشتی تایبەتی کەسێك. (٦) molding .

*v.t.* (١) لەقاڵبدان؛ داڕشتن؛ بە قاڵب دروستکردن.
(٢) دروستکردن یا ڕێك وپێك کردن لەسەر شێوەیەکی تایبەتی؛ گەڵاڵەکردن
*( to ~ a person's character)*

**mold, mould** (mōld), *n.* کەڕوو

*v.i.* کەڕوو هەڵهێنان.

**mold, mould** (mōld), *n.* (١) خاك (بەتایبەتی هی فشەڵ و پڕ لە
ڕووەکی گەنیوو بۆ کشتوکاڵ کردن باش). (٢) [Poetic]، (ا) زەمین؛ خاك.
(ب) گڵی گۆڕ. (٣) [Obs.]: گڵ (کە بەپێی ئاین مرۆڤی لێ دروست بووە)؛
خاك.

**molder** (mōl′dēr), *v.i.* ڕزین؛ پووان.

*v.t.* ڕزاندن؛ پوواندن.

**molding, moulding** (mōl′diŋ), *n.* (١) لەسەر قاڵب دەرهێنان؛
بە قاڵب دروستکردن؛ قاڵبکاری؛ داڕشتن.
(٢) شتێکی لەسەر قاڵب دروستکراو. (٣) نەقشی ڕازێنەرەوە (خانووسازی
(٤) تەختەدارێکی بارێکە لە بنی دیوارو قەراغی بنمیچ و شوێنی تری خانوو
دەدرێ بۆ جوانی و قایمی و شت داپۆشین.

**moldy, mouldy** (mōl′di), *adj.* کەڕوواوی؛ کەڕوو هەڵهێناو؛
بۆن کردوو؛ بۆن کۆنی لێ دێ؛ بۆگەن.

-moldiness *(n.)*.

**mole** (mōl), *n.* خاڵ.

**mole** (mōl), *n.* مشکەکوێرە؛ جرجەکوێرە.

**mole** (mōl), *n.* (١) بەربەستی کەنار دەریا (بۆ پاراستنی بەندەر).
(٢) بەندەری پارێزراو لە شەپۆلی دەریا بە بەربەستێکی وەها.

**mole, mol** (mōl), *n.* کێشی گەردی بە گرام (کیمیا).

**mole** (mōl), *n.* تۆپەڵە گۆشتی زیادەی ناو منداڵدان؛ ئاوساوی ناو
منداڵدان (لە نەخۆشی و باش گەورە نەبوونی ئاوڵەمەوە دروست دەبێ).

**molecular** (mə-lek′yoo-lēr), *adj.* گەردیلەیی؛ گەردی.

**molecule** (mol′ə-kūl′), *n.* (١) گەردیلە؛ گەرد.
(٢) تۆز؛ ئەخت؛ ئەختاڵ؛ تۆسقاڵ.

**molehill** (mōl′hil′), *n.* تەپۆڵکەیەکی بچکۆلەی خۆڵە مشکەکوێرە
یا گۆڕهەڵکەنە لەژێر زەوی‌یەوە دەریدەدات.

make a mountain out of a molehill, شتی بچووك زۆر زل کردن؛
گیروگرفتی بچووك و هیچ وپووچ زل کردن؛ شت گەورەکردن.

**molest** (mə-lest′), *v.t.* دەست هێنانە ڕێ (بەمەبەستی جووت بوون)؛
دەستدرێژی کردنە سەر مرۆڤ؛ پەستکردن؛ دەست تێوەدان و ئازاردان:
*( to ~ a child, girl, woman, etc.)*

-molestation *(n.)*; molester *(n.)*.

**moll** (mol), *n.* [Slang], (١) دۆستی تاوانکارێك یا دزێك.
(٢) ئافرەتێکی سووك؛ قەحبە.

**mollah** (mol′ə), *n.* = mullah.

**mollify** (mol′ə-fī′), *v.t.* (١) دڵنەوایی کردن؛ دڵ نەرم کردن؛
دڵ هێنانەوە جێی خۆ. (٢) هێمن کردنەوە؛ ساردکردنەوە؛ خاوکردنەوە؛
دامرکاندنەوە (تووڕەیی): *( to ~ a person's anger)*.

-mollification *(n.)*; mollifier *(n.)*.

**mollusc** (mol′əsk), *n.* = mollusk.

**molluscan, molluskan** (mə-lus′kən), *adj.* هی گیاندارە
نەرمە قاوغدارەکان.

**mollusk, mollusc** (mol′əsk), *n.* گیانداری نەرمی قاوغدار یا
قاقلەداری ئاوی (وەك گوێنکەماسی و شەیتانۆکە... هتد).

**molly** (mol′i), *n.* ماسی‌یەکی ڕەنگاوڕەنگە بۆ جوانی پەروەردە دەکرێ

**mollycoddle** (mol′i-kod′'l), ***n.*** پیاوێك یا كوڕێكی بەنازی سەرژنانەی نوورەڵە

***v.t.*** نازكێشان

**Molotov cocktail,** [Slang], نارنجۆكێكە بریتییە لە شووشەیەكی پڕ لە بەنزین یا شلەی ئاگرگری تر

**molt** (mōlt), ***v.i.*** كاژ فڕێدان، تووڕ فڕێدان؛ پەڕی كۆن فڕێدان و هی تازە دەركردن

***n.*** (١) كاژ فڕێدان، پەڕی كۆن فڕێدان (٢) كاژ یا پەڕی فڕێدراو

**molten** (mōl′t'n), *archaic past participle of* melt.

***adj.*** (١) تواوە، توێنراوە (٢) توێنراوە و لە قالبدا داڕێژراو

**mom** (mom), ***n.*** [Colloq.]. = **mother.**

**moment** (mō′mənt), ***n.*** (١) ماوەیەكی كورت؛ ماوەیەكی زۆر كەم؛ هەناسە ***( He'll join you in a ~ .)***
(٢) كاتێكی تایبەتی ***( at that ~ )***
(٣) كاتێكی گرنگ.
(٤) گرنگی، بایەخ ***( business of great ~ )***
(٥) زەبری هێز (مەكینەناسی).

**the moment,** ئێستا؛ لەم كاتەدا ***( I'm busy at the moment.)***

**the moment that,** هەر كە؛ یەكسەر كە

**momentarily** (mō′mən-ter′ə-li), ***adv.*** (١) بۆ هەناسەیەك؛ بۆ ماوەیەكی زۆر كەم ***( The phone was ~ out of order.)***
(٢) پاش نەختێك؛ بەم زووانە؛ هەر ئێستا ***( We will start ~ .)***
(٣) هەموو هەناسەیەك؛ لە چركەیەكەوە بۆ چركەیەكی تر.

**momentary** (mō′mən-ter′i), ***adj.*** (١) سەردەمی، كاتی، كورت
(٢) هەموو هەناسەیەك ڕوودەدات

**-momentariness** ***(n.).***

**momently** (mō′mənt-li), ***adv.*** (١) هەموو هەناسەیەك؛ لە چركەیەكەوە بۆ چركەیەكی تر (٢) یەكسەر
(٣) بۆ هەناسەیەك؛ بۆ چركەیەك.

**momentous** (mō-men′təs), ***adj.*** زۆر گرنگ ***( a ~ decision)***

**-momentousness** ***(n.).***

**momentum** (mō-men′təm), ***n.*** گوڕ؛ تەوژم، تاو، هێز، تین؛ پاڵ پێوەنانێكی بەتین ***( Falling objects gain ~ . ; The revolutionary movement is gathering ~ .)***

**Momus** (mō′məs), ***n.*** (١) خودای لاقرتێ و ڕەخنە (ئەفسانەی یۆنانی)
(٢) [m-]، كەسێكی زۆر ڕەخنەگر؛ زۆر بە ڕەخنە.

**monachal** (mon′ə-k'l), ***adj.*** = **monastic.**

**monachism** (mon′ə-kiz′m), ***n.*** = **monasticism.**

**monad** (mon′ad, mō′nad), ***n.*** (١) یەكە، شتێكی یەك پارچە كە بەش نەكرێ (٢) زیندەوەرێكی یەك شانە؛ ئەمیبا
(٣) گەردیلەیەكی یەك هاوهێزی (كیمیا).

**monadelphous** (mon′ə-del′fəs), ***adj.*** نێرەكانی پێكەوەن وەك چەپكێك (ڕووەكناسی)

**monandrous** (mə-nan′drəs), ***adj.*** (١) تاك مێردار، یەك مێردار
(٢) تایبەتی بە تاك مێرداری (٣) تاك نێركدار، یەك نێركدار.

**monandry** (mə-nan′dri), ***n.*** تاك مێرداری، یەك مێردی، یەك مێرداری

**monarch** (mon′ērk), ***n.*** (١) پاشا
(٢) جۆرە پەپوولەیەكی ئەمەریكایی قاوەیی سووركاری قەراغ باڵ ڕەشە

**-monarchal; monarchial** ***(adj.).***

**monarchic** (mə-när′kik), ***adj.*** *Also* monarchical. پاشایی، تایبەتی بە پاشا

**monarchism** (mon′ēr-kiz′m), ***n.*** بیروباوەڕی پاشایەتی، ڕژێمی پاشایەتی پەرستی؛ پاشایەتی خواستن

**monarchist** (mon′ēr-kist), ***n.*** پاشایەتی پەرست؛ پاشاپەرست؛ پاشاخواز.

**-monarchistic** ***(adj.).***

**monarchy** (mon′ēr-ki), ***n.*** (١) ڕژێمی پاشایەتی، پاشایی
(٢) شانشین؛ وڵاتی شانشین.

**monastery** (mon′əs-ter′i), ***n.*** پەرستگای ووشكەسۆفییان؛ نشینگەی ووشكەسۆفییان؛ خەڵوەتگای ئاینی؛ تەكیە (خاچ پەرستی)

**monastic** (mə-nas′tik), ***adj.*** (١) هی پەرستگای ووشكەسۆفییان
(٢) هی ووشكەسۆفی؛ ووشكەسۆفییانە.

***n.*** ووشكەسۆفی.

**-monastical** ***(adj.).***

**monasticism** (mə-nas′tə-siz′m), ***n.*** ژیانی ووشكەسۆفیتی؛ ووشكەسۆفیتی

**monatomic** (mon′ə-tom′ik), ***adj.*** (١) تاك گەردیلەیی.
(٢) تاك هاوتایی (كیمیا).

**Monday** (mun′di), ***n.*** دووشەممە.

**monetarily** (mon′ə-ter′ə-li, mun′ə-ter′ə-li), ***adv.*** لەڕووی پارەوە؛ لەڕووی سكەوە.

**monetary** (mon′ə-ter′i, mun′ə-ter′i), ***adj.*** (١) هی سكە؛ تایبەتی بە سكەی وڵاتێك (٢) هی پارە.

**money** (mun′i), ***n.*** (١) پارە؛ دراو (٢) سامان.

**in the money,** [Slang], (١) براوەیە؛ لە براوەكانە
(٢) دەوڵەمەند؛ زەنگین؛ سەرمایەدار.

**make money,** پارە پەیداكردن؛ پارە دەسكەوتن

**put money into,** پارە تێخستن؛ پارە تێدا خەرج كردن.

**put money on,** گرەو لەسەر كردن.

**moneybag** (mun′i-bag′), ***n.*** (١) كیسەی پارە.
(٢) ***(pl.)*** [Colloq.]، (أ) سامان، سەرمایە.
ب) كەسێكی پارەدار.

**money-changer** (mun′i-chān′jēr), ***n.*** (١) پارە گۆڕەوە (هی جۆرەها وڵات) (٢) مەكینەی پارە ووردكەرەوە.

**moneyed** (mun′id), ***adj.*** (١) دەوڵەمەند؛ زەنگین؛ پارەدار
(٢) هی پارە و پارەداران؛ نوێنەری پارە و سەرمایەداران.

**moneylender** (mun′i-len′dēr), ***n.*** پارە بە قەرزدەر بە قازانج؛ سووخۆر.

**money-maker** (mun′i-māk′ēr), ***n.*** (١) كەسێكی پارە كۆكەرەوە؛ كەسێكی پارە (زۆر) پەیداكەر (٢) ئیشێكی بەسوود و پارە پەیداكەر؛ شتێك یا كاسبییەكی پارە پەیداكەر ***( This business is a ~ .)***

**money-making** (mun′i-māk′iŋ), ***n.*** (١) پارە پەیداكردن؛ پارە دەسكەوتن؛ قازانج كردن (٢) سكەلێدان.

***adj.*** (١) بەسوود؛ پارەی زۆر تێدایە؛ پارەی لێ دەست دەكەوێ ***( a ~ business)***
(٢) پارە پەیداكەر؛ خەریكی پارە پەیداكردنە.

**money order,** حەواڵە؛ حەواڵەی پارە (لە پۆستەخانە دەكرێ).

**monger** (muŋ′gēr), ***n.*** (١) فرۆشیار، فرۆش ***( fishmonger)***
(٢) دەڵاڵ؛ كەسێك كە بازرگانی بە شتێكی ناپەسەندەوە بكات؛ كەسێكی بەدخواز ***( warmonger, scandalmonger)***

**Mongol** (moŋ′gəl, moŋ′gol, moŋ′gōl), ***n.*** (١) هاووڵاتییەكی مەنگۆلیا؛ كەسێكی مەنگۆلی (٢) زمانی مەنگۆلی

**Mongolian** (moŋ-gō′li-ən, mon-gōl′yən), ***adj.*** (١) تایبەتی بە مەنگۆلیا و گەلەكەی و كلتوورەكەی (٢) مەنگۆلی (٣) زمانی مەنگۆلی
(٤) تووشی " Mongolism " بووە (ئەم ووشەیە ببینە).

***n.*** (١) هاووڵاتی مەنگۆلیا؛ كەسێكی مەنگۆلی (٢) زمانی مەنگۆلی.

**Mongolism** (moŋ′gəl-iz′m), ***n.*** بێ مێشكی مەنگۆلی؛ بارێكی زگماكییە بریتییە لە مێشك سووكی و ڕاست و چەپی چاو و نزیكیان

لەیەکەوە و کەللە تەختی

**Mongoloid** (moŋ′gəl-oid′), *adj.* (١) مەنگۆلی.
(٢) بێ مێشکی مەنگۆلی تووش بووە (وشەی پێشوو ببینە).

**mongoose, mongoos** (moŋ′gōōs, muŋ′gōōs), *n.* جۆرە گیاندارێکی گۆشتخۆرە توانای ڕاوکردنی جرج و ماری ژەهراوی ... هتد هەیە.

**mongrel** (muŋ′grəl, moŋ′grəl), *n.* (١) دووڕەگ (بەتایبەتی سەگ)؛ گیانداری دووڕەگ. (٢) مرۆڤی دووڕەگ؛ مرۆڤی ناڕەسەن.
(٣) شتی دوو توخم؛ شتی ناڕەسەن.
*adj.* دووڕەگ (لەڕووی سووکییەوە)؛ ناڕەسەن.

**monicker, moniker** (mon′i-kẽr), *n.* [Slang]. ناو؛ نازناو

**monism** (mon′iz'm, mō′niz'm), *n.* بیروباوەڕێکی فەلسەفییە کە دەڵێت بیرو ماددە هەمووی یەکەو ڕاستێتی گەردوون هەر یەکەو پارچە پارچە ناکرێ.

**monition** (mō-nish′ən), *n.* (١) وریاکردنەوە؛ ئاگادارکردنەوە؛ ئاگاداری (مەترسی). (٢) فەرمانی سەرەک قەشە بە نەکردنی تاوانێک.
(٣) بانگ کردن بۆ دادگا.

**monitor** (mon′ə-tẽr), *n.* (١) [Rare]، ئامۆژگار؛ ئامۆژگاریکەر.
(٢) قوتابی چاودێر؛ چاودێری پۆل؛ چاودێر. (٣) بیرخەرەوە؛ ئاگادارکەرەوە؛ وریاکەرەوە. (٤) جۆرە قۆڕییەکی گەورەی ماسی خۆرە.
(٥) گیرەی سەر لوولەی ئاو (ئاگرکوژاندنەوە)
(٦) ئامێری چاودێریکەر (مەکینەی ئەلەکترۆنی و ڕاگەیاندن).
*v.t. & v.i.* (١) چاودێری کردن (مرۆڤ، شت، بار... هتد):
*( to ~ a person, situation, etc.)*
(٢) چاودێری کردنی مەکینەی ئەلەکترۆنی و ڕاگەیاندن (ڕادیۆ و تەلەفزیۆن).

**monitorial** (mon′ə-tôr′i-əl, mon′ə-tō′ri-əl), *adj.* تایبەتی بە چاودێری یا ئامۆژگاری.

**monitorship** (mon′ə-tẽr-ship′), *n.* پلەوپایەو ماوەی پێ سپاردنی چاودێری پۆل یا هەر چاودێرییەک.

**monitory** (mon′ə-tôr′i, mon′ə-tō′ri), *adj.* وریاکەرەوە؛ ئاگادارکەرەوە؛ بیرخەرەوە: *( a ~ glance)*.
*n.* نامەی وریاکەرەوە؛ نامەی ئاگادارکردن.

**monk** (muŋk), *n.* وشکەسۆفی (خاچ پەرستی)؛ خواپەرست؛ کەشیش؛ قەلەندەر؛ پەرستگانشین.

**monkery** (muŋk′ẽr-i), *n.* (١) وشکەسۆفێتی؛ ژیانی وشکەسۆفی؛ ژیانی وشکەسۆفێتی. (٢) پەرستگای وشکەسۆفی؛ تەکیە.
(٣) وشکەسۆفییان

**monkey** (muŋ′ki), *n.* (١) مەیموون
(٢) منداڵێکی قۆشمەو هاروهاج و دەمەلاسکێکەر.
(٣) [Slang]، کەسێکی گاڵتەپێکراو؛ گاڵتەچی خەڵک.
(٤) ئامێری جۆراوجۆری مەکینەکاری
*v.i.* [Colloq.] ( ~ with; ~ around with ), یاری پێکردن؛ دەست تێوەدان؛ خۆ پێوە خلافاندن؛ دەست تێخستن (کاروباری خەڵک).
*v.t.* [Rare], لاسایی کردنەوە؛ دەمەلاسکێ کردن.

**monkey business**, [Slang], کردەوەو کرد ری چەوت؛ ڕەووشتی بێ مێشکانەو ناپاک و تەڵەکەبازی؛ فێڵبازی.

**monkeyish** (muŋ′ki-ish), *adj.* مەیموونی؛ وەک مەیموون؛ مەیموون ئاسایی

**monkeyshine** (muŋ′ki-shīn′), *n.* [Slang], usually in pl., فێڵ وتەڵەکە؛ گاڵتەوگەپ؛ گاڵتە.

**monkey wrench**, (١) ئیسپانەیەکە دەمەکەی دەگونجێنرێ بۆ ئەوەی بۆ هەموو جۆرە بورغویەک ببێت. (٢) [Colloq.]، تێکدەر؛ شتی تێکدەر یا شێوێنەر: *( He threw a ~ into the plans.)*.

**monkhood** (muŋk′hood′), *n.* (١) ژیانی وشکەسۆفی؛ قەلەندەری؛ وشکەسۆفێتی. (٢) وشکەسۆفییان.

**monkish** (muŋk′ish), *adj.* وەک وشکەسۆفی؛ وشکەسۆفییانە؛ وشکەسۆفی ئاسا.

**mono-, mon-** (mon′ō, mon′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) تاک؛ تاکە؛ یەک؛ تەنها. (٢) تاک گەردیلە؛ یەک گەردیلە.

**monocarpic** (mon′ə-kär′pik), *adj.* یەک جار بەر دەگرێ و دەمرێ؛ یەک بەری؛ ساڵەکی.

**monochord** (mon′ə-kôrd′), *n.* (١) ئامێری مۆسیقی یەک ژێ.
(٢) [Rare]، یەک نەوایی؛ گونجان؛ یەک دەنگی.

**monochromat** (mon′ə-krō-mat), *n.* کەسێکە کە ڕەنگ نابینێ؛ یەک ڕەنگە؛ ڕەنگ کوێر.

**monochromatic** (mon′ə-krō-mat′ik), *adj.* (١) یەک ڕەنگی.
(٢) یەک شەپۆل (ڕووناکی).

**monochromatism** (mon′ə-krō-mat′iz'm), *n.* ڕەنگ کوێری؛ ڕەنگ نەبینین تەنها هی بۆر نەبێ.

**monocle** (mon′ə-k'l), *n.* چاویلکەی یەک چاو.

**monoclinous** (mon′ə-klī′nəs), *adj.* نێرومێ پێکەوە (ڕووەکناسی)؛ نێرک و نێرەکی پێکەوەن لە هەمان گوڵدا.

**monocracy** (mə-nok′rə-si), *n.* فەرمانڕەوایی یەک کەسی؛ فەرمانڕەوایی ڕەها؛ پاشایەتی.

**monocrat** (mon′ə-krat′), *n.* فەرمانڕەوایی یەک کەسی پەرست؛ لایەنگری فەرماتڕەوایی ڕەها؛ پاشایەتی پەرست.

**monocular** (mə-nok′yoo-lẽr), *adj.* (١) یەک چاوە؛ تاک چاو؛ تاکە چاو. (٢) یەک چاوی؛ بۆ یەک چاو کراوە.

**monodrama** (mon′ə-drä′mə), *n.* شانۆگەری یەک کەسی

**monody** (mon′ə-di), *n.* (١) هەڵبەستی گۆرانی (لە شانۆنامەی کارەساتیی یۆنانی کۆندا). (٢) هۆنراوەی شیوەن؛ هەڵبەستی لاوانەوە.
(٣) دەنگێکی یەک نەوا (وەک هی شەپۆل).
(٤) ئاوازێکی مۆسیقی یا گۆرانییە کە یەک دەنگ تیایدا زاڵە بەسەر دەنگەکانی تردا.
-monodic *(adj.)*; monodically *(adv.)*; monodist *(n.)*.

**monoecious** (mə-nē′shəs, mō-nē′shəs), *adj.* (١) نێرەمووک.
(٢) تاک ماڵ (ڕووەکناسی)؛ نێرک و نێرەکی لە هەمان ڕووەکدان بە گوڵی جیاواز؛ نێرومێی پێکەوەیە (ڕووەکناسی).

**monogamist** (mə-nog′ə-mist), *n.* پیاوی یەک ژنە؛ یەک هاوسەرە؛ ژنی یەک مێردە.

**monogamous** (mə-nog′ə-məs), *adj.* یەک ژنە؛ یەک مێردە؛ یەک هاوسەرە.

**monogamy** (mə-nog′ə-mi), *n.* (١) یەک ژنی؛ یەک مێردی؛ یەک هاوسەری. (٢) [Rare]، یەک جار ژنهێنان یا شووکردن لە هەموو ژیاندا

**monogenesis** (mon′ə-jen′ə-sis), *n.* (١) پەیدابوونی هەموو زیندەوەر لە یەک شانە. (٢) زیادبوون یا زاوزێ کردن لەڕێی کەرت بوونی شانەوەو بوونی هەر کەرتێک بە زیندەوەرێکی تازە.
(٣) monogenism.
-monogenic *(adj.)*; monogenetic *(adj.)*.

**monogenism** (mə-noj′ə-niz'm), *n.* پەیدابوونی هەموو مرۆڤ لە یەک کەسەوە یا لە یەک جووت باو و باپیرەوە.

**monogram** (mon′ə-gram′), *n.* نیشانەیەکی دوو تیپی یا زیاترە بەتایبەتی تیپی یەکەمی ناو و نازناوی کەسێک دەدرێ لە نامەو دەستەسڕ و چاکەت و جۆرەها شتی ئەو کەسە.
*v.t.* نیشانەی ڕەها لێدان.

**monograph** (mon′ə-graf′, mon′ə-gräf′), *n.* (١) وتارێک یا پەرتووکێکە دەربارەی باسێکی تەسک. (٢) وتارێکە دەربارەی توخمێک ڕووەک یا گیاندار.
-monographer *(n.)*; monographic *(adj.)*.

**monogyny** (mə-noj′ə-ni), *n.* یەک ژنی؛ یەک ژنهێنان لە هەمان کاتدا.
-monogynist *(n.)*; monogynous *(adj.)*.

**monolatry** (mə-nol′ə-tri), *n.* یەک خوا پەرستی: پەرستنی تاکە خوایەک بەلام بڕوابوون بە خوای تریش.
**monolith** (mon′ə-lith′), *n.* (١) تلەبەردێکی گەورەیە (لە خانووسازی هەروەها پەیکەرکاریدا بەکاردەهێنرێ). (٢) پەیکەرێکی یەک تلەبەردی؛ پایە.
**monolithic** (mon′ə-lith′ik), *adj.* (١) تلەبەردی؛ وەک تلەبەرد وایە. (٢) گەورەو یەک پارچەو پتەوو یەک نەواو چوونیەک.
**monologue** (mon′ə-lôg′, mon′ə-log′), *n.* *Also* monolog, مۆنۆلۆج (١) ووتارێکی دوورودرێژی یەک کەسی؛ دووانێکی یەک کەسی؛ گفتوگۆیەکی یەک لایی. (٢) هەڵبەستێکە بە زمانی یەک کەسەوە. (٣) خۆ دوواندن (شانۆنامە)؛ دووانی یەک کەسی (شانۆنامە). (٤) خونوواندنێکی دووانی یەک کەسی
-**monologist; monologuist** *(n.)*.
**monomania** (mon′ə-mā′ni-ə), *n.* (١) خولیای یەک بیر (نەخۆشی دەروونی). (٢) سەرنجی بێ ئەندازە دان بە بیرێک یا باسێک؛ خولیا.
**monomaniac** (mon′ə-mā′ni-ak′), *n.* شێتی یەک بیر؛ خولیای یەک بیر یا شت.
**monometallic** (mon′ō-mə-tal′ik), *adj.* (١) یەک کانزایی؛ لە یەک کانزا پێکهاتوو (٢) یەک کانزا بەکارهێن (سکەلێدان)
**monometallism** (mon′ə-met′'l-iz'm), *n.* بەکارهێنانی یەک کانزا وەک زێر یا زیو بۆ بنچینەی سکە.
**monomial** (mō-nō′mi-əl), *adj.* (١) یەک رادەیی (جەبر، ژمارەو پێوان). (٢) یەک ووشەیی (ناو: زیندەوەرزانی)
**monomolecular** (mon′ō-mə-lek′yoo-lẽr), *adj.* یەک گەردیلەیی.
**monophagous** (mon′ə-fā′gəs), *adj.* یەک جۆر خواردەمەنی خۆر (جانەوەر).
**monophobia** (mon′ə-fō′bi-ə), *n.* ترسی تەنیایی.
-**monophobic** *(adj.)*.
**monophonic** (mon′ə-fon′ik), *adj.* (١) یەک ئاوازی؛ یەک دەنگی. (٢) یەک کەناڵی هەوایی (ئامێری ئەلەکترۆنی)
**monophony** (mə-nof′ə-ni), *n.* مۆسیقای یەک ئاواز
**monophthong** (mon′əf-thôŋ′, mon′əf-thoŋ′), *n.* (١) تاک دەنگی تیپە بزوێن (وەک " a " لە ووشەی " **father** " دا). (٢) دوو تیپە بزوێنی یەک دەنگ (وەک " **ea** " لە ووشەی " **leaf** " دا).
**monophyletic** (mon′ə-fī-let′ik), *adj.* (١) یەک بنەچەیی؛ هی یەک بنەچە؛ یەک سەرچاوەیی. (٢) یەک توخمی (ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی).
**monoplane** (mon′ə-plān′), *n.* فڕۆکەی دووباڵ (ووشەی " **biplane** " ببینە).
**monopode** (mon′ə-pōd′), *adj.* یەک پێیی.
*n.* گیانداری یەک پێ (بەتایبەتی توخمە مرۆڤێکی ئەفسانەیی).
**monopolist** (mə-nop′ə-list), *n.* (١) قۆرخکەر (٢) لایەنگری قۆرخکاری
**monopolistic** (mə-nop′ə-lis′tik), *adj.* قۆرخی؛ قۆرخکاری
**monopolize** (mə-nop′ə-līz′), *v.t.* قۆرخکردن؛ قەدەغەکردن لە کۆمپانیا یا خەڵکی تر.
-**monopolization** *(n.)*; **monopolizer** *(n.)*.
**monopoly** (mə-nop′ə-li), *n.* (١) قۆرخ؛ قۆرخکاری؛ قۆرخکردن؛ قەدەغەکردن (٢) قەدەغەکردن بۆ خۆ. (٣) شتێکی قۆرخکراو. (٤) کۆمپانیایەک یا چەند کۆمپانیایەکی قۆرخکەر.
**monorail** (mon′ə-rāl′), *n.* تاک هێڵی ئاسن (بۆ شەمەندەفەرو مەکینەی ڕەورەوەدار).
**monosepalous** (mon′ə-sep′'l-əs), *adj.* یەک گەڵایی (تەختەی گوڵ)
**monospermal** (mon′ə-spũr′m'l), *adj.* = monospermous.
**monospermous** (mon′ə-spũr′məs), *adj.* تاک تۆوی (ڕووەکناسی)
**monosyllabic** (mon′ə-si-lab′ik), *adj.* یەک بڕگەیی (زمانەوانی).
**monosyllable** (mon′ə-sil′ə-b'l), *n.* ووشەی یەک بڕگەیی (وەک **man, bed, etc.**).
**monotheism** (mon′ə-thē-iz'm), *n.* یەک خواپەرستی؛ یەک خواناسی.
**monotheist** (mon′ə-thē′ist), *n.* یەک خواپەرست؛ یەک خواناس.
**monotheistic** (mon′ə-thē-is′tik), *adj.* یەک خواپەرست؛ یەک خواناس.
-**monotheistical** *(adj.)*; **monotheistically** *(adv.)*.
**monotone** (mon′ə-tōn′), *n.* (١) یەک دەنگ؛ یەک ئاواز؛ یەک نەوا: *( to speak in a ~ )* (٢) گۆرانی ووتن، ووتار خوێندنەوە، یا دووانی یەک نەوا. (٣) گۆرانی بێژێک یا ووتارخوێنەرەوەیەکی یەک نەوا.
*adj.* یەک دەنگ؛ یەک ئاواز؛ یەک نەوا.
**monotonous** (mə-not′ə-nəs), *adj.* (١) یەک نەوا؛ یەک ئاواز؛ یەک دەنگ. (٢) ووشک (مەجاز)؛ ووشکو ناخۆش؛ بێ تاقەتکەر (لەبەر چوونیەکی): *( a ~ speech, lecture, person, life, day, job, etc.)*.
-**monotonously** *(adv.)*.
**monotony** (mə-not′ə-ni), *n.* (١) یەک نەوایی؛ یەک ئاوازی؛ یەک دەنگی؛ چوونیەکی (٢) ووشکی (مەجاز)؛ ووشکیو ناخۆشی.
**monotype** (mon′ə-tīp′), *n.* (١) تاکە جۆری توخمەکەی (زیندەوەرزانی). (٢) (ا) مەکینەی داڕشتنی تیپی تاک تاک (چاپەمەنی) (ب) تیپی بەم جۆرە داڕێژراو.
**monovalent** (mon′ə-vā′lənt), *adj.* (١) تاک هاوتا (کیمیا) (٢) بەرهەڵستیکەری هەندێ میکرۆب.
-**monovalence** *(n.)*.
**monoxide** (mon-ok′sīd, mə-nok′sīd), *n.* یەکەم ئۆکسید.
**Monseigneur, monseigneur** (mon′sen-yũr′), *n.* (١) نازناوێکی فەرەنسییە دەدرێ بە کەسانی پایەدار وەک میرو سەرەک قەشە (٢) کەسێکە کە ئەم نازناوەی درابێتێ.
**monsieur** (mə-syö′), *n.* [Fr.], مسیۆ: ووشەیەکی فەرەنسییە بەرامبەر بە " **Mr.** " ی ئینگلیزییە بەمانای " کاک ".
**Monsignor, monsignor** (mon-sēn′yẽr), *n.* (١) نازناوی هەندێ کاربەدەستانی بەرزو سەرەک قەشەی کاسۆلیکییە. (٢) کەسێکە کە ئەم نازناوەی هەبێ.
**monsoon** (mon-sōōn′), *n.* (١) مۆنسوون: وەرزە بایەکی ناوچەی زەریای هیندیو خوارووی ئاسیایە. (٢) وەرزی ئەم بایە. (٣) بایەکە کە هەر وەرزە بەرەو لایەک هەڵ بکات یا لەنێوان دەریاو ووشکانی دەوروپشتیدا هەڵ بکات.
**monster** (mon′stẽr), *n.* (١) دەعبا؛ گیاندار یا ڕووەکێکی نائاساو سەیر. (٢) دەعبا؛ زیندەوەرێکی ئەفسانەیی. (٣) کەسێکی دڕندەو ناپەسەندو بەدخوو پیسو ناشرین. (٤) گیانەوەر یا شتی زل؛ عیفریت.
**monstrosity** (mon-stros′ə-ti), *n.* (١) جانەوەری؛ دەعبایەتی؛ ناپەسەندی؛ پیسوبۆگەنی؛ بەدی. (٢) جانەوەر؛ دەعبا؛ شتێک یا گیاندارێکی زل؛ زیندەوەرێکی نائاسا.
**monstrous** (mon′strəs), *adj.* (١) زۆر زل؛ زۆر زلو قەبە. (٢) نائاسا لە شێوە یا سرووشتدا؛ ناسرووشتی. (٣) لە دەعباچوو؛ سەیرو ناشرین. (٤) تۆقێنەر؛ زۆر خراپ؛ پیس؛ زۆر ناپەسەند؛ بەد: *( a ~ crime)*
**montage** (mon-täzh′, mōn-täzh′), *n.* (١) مۆنتاژ: (ا) هونەرو شێوازی لێکدانو خستنە تەنیشتو سەر یەکتری چەند وێنەیەکی جیاواز. (ب) وێنەیەکی پێکهێنراو بەم شێوەیە.

(٢) مۆنتاژ: (ا) دروستکردن و ڕێکخستنی زنجیرەیەك وێنەو نواندنی سینەما دەربارەی هەمان باس. (ب) بەرنامەیەکی سینەمایی یا تەلەفزیۆنی وەها.
**month** (munth), *n.* مانگ
**month after month,** مانگ لەدوای مانگ؛ هەموو مانگێك.
**month by month,** مانگ بە مانگ.
**month in, month out,** هەموو مانگێك
**monthly** (munth′li), *adj.* (١) مانگی؛ مانگێك دەخایەنێ؛ مانگێکی بێ دەچێ. (٢) مانگانە؛ مانگی جارێك دەکرێ یا دەدرێ؛ مانگی: *(a ~ magazine)*
(٣) هی بێ نوێژی ئافرەت.
*n.* (١) گۆڤارێکی مانگانە؛ مانگنامە. (٢) (*pl.*)، بێ نوێژی ئافرەت.
*adv.* مانگی؛ مانگی جارێك؛ هەموو مانگێك.
**monument** (mon′yoo-mənt), *n.* (١) پەیکەری یادگار؛ خانووی یادگار (٢) پاشماوەی دێرین یا مێژوویی.
(٣) شتێکی گرنگ و بەبایەخی نەمر. (٤) بەردی سنوور؛ نیشانەی سنوور
(٥) [Obs.]، گۆڕ (٦) [Obs.]، پەیکەر.
**monumental** (mon′yoo-men′t′l), *adj.* (١) یادەوەری؛ هی یادگار. (٢) گرنگ؛ نەمر؛ بەنرخ؛ مەزن؛ گەورە: *(a ~ book)*.
(٣) زل؛ گەورە (٤) سەرسوورمێنەر؛ لە ئەندازە بەدەر؛ زۆر: *(~ ignorance, ineptitude, etc.)*
**-mony** (mō′ni), پاشگرێکە بەمانای: ئەنجامی شت، بار، یا دۆخ: *(patrimony, sanctimony)*
**moo** (mōō), *n.* بۆڕە (گاو مانگا).
*v.i.* بۆڕاندن؛ بۆڕەبۆڕکردن.
**mooch, mouch** (mōōch), *v.i.* [Slang], (١) خۆ مات کردن؛ بەخشیەو بەدزییەوە ڕۆیشتن. (٢) سووڕانەوە؛ جادە پێوان.
*v.t.* [Slang], (١) دزین (٢) ناخوونەك کردن؛ مشەخۆری کردن؛ سوالکردن.
**mood** (mōōd), *n.* (١) باری هۆش و هەست و مێشك؛ سرووشت: *(in a merry, gloomy, bad ~ )*
(٢) (*pl.*)، پەستی؛ بەرچاوتاریکی؛ ڕووگرژی.
(٣) [Obs.]، توورەیی.
**mood** (mōōd), *n.* بار یا ڕێژەی کردار (ڕێزمان): لە زمانی ئینگلیزیدا کردار سێ بار یا ڕێژەی هەیە: ( indicative, subjunctive, imperative)
**moodiness** (mōōd′i-nis), *n.* دلتەنگی؛ پەستی؛ دەمێك دلخۆش و دەمێك غەمبار؛ زوو زوو گۆڕانی باری هەست؛ بێ باری باری هەست.
**moody** (mōōd′i), *adj.* (١) دەمێك دلخۆش و دەمێك غەمبار؛ زوو زوو هەست و هۆش بگۆڕ؛ بێ بار (هەست و هۆش و سرووشت).
(٢) پەست؛ ڕووگرژ؛ دلتەنگ.
-moodily *(adv.).*
**moon** (mōōn), *n.* (١) مانگ؛ هەیڤ. (٢) مانگ (کات)
(٣) مانگەشەو؛ شەوقی مانگەشەو. (٤) ئەستێرەیەکی بچووکە کە بەدەوری یەکێکی گەورەتردا بسووڕێتەوە.
*v.i.* زڕەخەوبینین؛ خەوبینین؛ سووڕانەوە
*v.t.* کات کوشتن بە زڕەخەوبینینەوە.
**moonbeam** (mōōn′bēm′), *n.* شەوقی مانگەشەو.
**moon-blind** (mōōn′blīnd′), *adj.* شەوکوێر
**moon blindness,** (١) شەوکوێری (٢) چاوئێشەی ئەسپ.
**mooncalf** (mōōn′kaf′, mōōn′käf′), *n.* (١) کەسێکی بەزگماکی بێ مێشك؛ بەزگماکی مێشك سووك (٢) زیندەوەرێکی سەیرو شێوە نائاسا.
**mooneye** (mōōn′ī′), *n.* (١) چاوی نەخۆشی ئەسپ (٢) شەوکوێری
(٣) جۆرە ماسییەکی ڕەنگ زیوییە.
**moon-eyed** (mōōn′īd′), *adj.* (١) شەوکوێر
(٢) ئەبلەق؛ چاو دەرپۆقیو لە ترس یا سەرسامیدا.
**moon-faced** (mōōn′fāst′), *adj.* دەموچاو خڕ
**moonfish** (mōōn′fish′), *n.* ماسییەکی دەریایی ڕەنگ زیوی خڕپنە.
**moonflower** (mōōn′flou′ēr), *n.* (١) ڕووەکێکی خۆهەلواسەری گوڵ سپییە بە شەو گوڵەکەی دەم دەکاتەوە لە توخمی لاولاوە.
(٢) گوڵی ئەم ڕووەکە.
**moonish** (mōōn′ish), *adj.* (١) مانگی؛ لە مانگ چوو.
(٢) بێ بار؛ حولحوڵ.
**moonlight** (mōōn′līt′), *n.* مانگەشەو؛ شەوقی مانگەشەو؛ شەوقی مانگ.
*adj.* (١) هی مانگەشەو؛ هی شەوقی مانگ.
(٢) مانگەشەو؛ بە شەوقی مانگ ڕووناك کراوەتەوە.
(٣) بە مانگەشەو کراو؛ بە شەو کراو.
*v.i.* کارێکی تر گرتنەدەست بەتایبەتی بە شەو.
**moonlighting** (mōōn′līt′iŋ), *n.* کارێکی تر گرتنەدەست کە پەیوەندی بە پیشەی ئەو کەسە خۆیەوە نەبێ بەتایبەتی بە شەو.
**moonlit** (mōōn′lit), *adj.* مانگەشەو؛ بە شەوقی مانگ ڕووناك کراوە.
**moonrise** (mōōn′rīz′), *n.* (١) مانگ هەڵهاتن.
(٢) کاتی مانگ هەڵهاتن.
**moonset** (mōōn′set′), *n.* (١) مانگ ئاوابوون.
(٢) کاتی مانگ ئاوابوون
**moonshine** (mōōn′shīn′), *n.* (١) مانگەشەو؛ شەوقی مانگ.
(٢) قسەی هیچ وپووچ و بێ مانا؛ قسەی قۆڕ.
(٣) [Colloq.]، ویسکی و ئەلکحولی تری بە قاچاخ دروستکراو یا فرۆشراو
*v.i.* بە قاچاخ ویسکی و ئەلکحولی تر دروستکردن یا فرۆشتن؛ قاچاخچێتی کردن بە ویسکییەوە.
**moonshiner** (mōōn′shīn′ēr), *n.* قاچاخچی ویسکی و خواردنەوەی ئەلکحولی تر؛ ویسکی و خواردنەوەی ئەلکحولی تر دروستکەر بە قاچاخ.
**moonstone** (mōōn′stōn′), *n.* بەردە مانگ: بەردێکی بەنرخی سپی ڕوونی بریقەدارە وەك مرواری وایە دەکرێ بە خشڵ.
**moonstruck** (mōōn′struk′), *adj. Also* moonstricken, -(١) دێوانە؛ مێشك تێکچوو؛ شێت. (٢) کوشتەی دلداری؛ شەیدای دلداری.
**moony** (mōōn′i), *adj.* (١) مانگی؛ وەك مانگ.
(٢) (ا) خڕ وەك مانگی چواردە شەو. (ب) کەوانەیی وەك مانگی نوێ.
(٣) مانگەشەو. (٤) بە شەوقی مانگ ڕووناك کراوە.
(٥) دالغەچی؛ دێوانە؛ شەیدا.
**Moor** (moor), *n.* (١) هاوولاتییەکی موسولمانی باکووری ئەفەریقا لە ڕەگەزی تێکەلاوی بەربەرو عەرەب؛ بەربەر. (٢) داگیرکەرێکی ئیسپانیا لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا (کە لەم نەتەوەیە بوون).
**moor** (moor), *n.* (١) دەشتی زۆنگاوی یا بنچکاوی و چۆل؛ چۆلەوانی؛ دەشتی چۆل. (٢) دەشتی پڕ لە باڵندە بۆ ڕاوکردن.
**moor** (moor), *v.t.* (١) لەنگەر هاویشتن؛ بەستنەوە بە گوریس و زنجیر (کەشتی، بەلەم، فڕۆکە). (٢) بەستنەوە؛ قایم کردن.
*v.i.* (١) لەنگەر هاویشتن؛ بەستنەوە (کەشتی). (٢) بەسترانەوە.
**moorage** (moor′ij), *n.* (١) لەنگەر فڕێدان؛ بەستنەوە.
(٢) لەنگەرگا. (٣) کرێی لەنگەر هاویشتن لە لەنگەرگادا.
**moor hen,** مریشکە ئاوی.
**mooring** (moor′iŋ), *n.* (١) لەنگەر هاویشتن؛ بەستنەوە (کەشتی، بەلەم، فڕۆکە). (٢) (*pl.*)، گوریس و زنجیری بەستنەوە. (٣) (*pl.*)، لەنگەرگا
**Moorish** (moor′ish), *adj.* تایبەتی بە بەربەرەکانی سەرووی ئەفەریقاو کلتوورەکەیان بەتایبەتی خانووسازی وەك: خانووسازی بەربەرەکان: *( M~ architecture)*
**moose** (mōōs), *n.* گیاندارێکی گەورەی ئەمەریکای باکوورە لە توخمی کەڵەکێوی ئەوەندەی کەڵگایەك دەبێ.
**moot** (mōōt), *n.* (١) ئەنجوومەنێکی ناوچەیی کۆنی ئینگلیزییە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکە. (٢) لێکۆڵینەوەیەکی گریمانەکی (بەتایبەتی هی داواکارییەك لە دانشگای یاسا بۆ مەشق کردن).

*adj.* جىَ‌ى گومانه؛ نەبڕاوەتەوە؛ بە لایەکدا نەخراوە:
*( a ~ question; That's a ~ point.)*
*v.t.* (١) لیکۆڵینەوە؛ باسکردن. (٢) هێنانە پێشەوە بۆ لیکۆڵینەوە.
(٣) لیکۆڵینەوەی داواکارىیەکی گریمانەکی هەر بۆ مەشق (لە دادگای لاسایی یا دروزنەدا بۆ قوتابیانی دانشگای یاسا):
**moot court,** دادگای لاسایی، دروزنە، یا مەشق (بۆ قوتابیانی دانشگای یاسا)
**mop** (mop), *n.* (١) گسکی ئیسفنج، ڕێس، یا پەڕو (بۆ شتن و سڕینەوەی زەمینەی ژوور). (٢) تۆپەڵە شتی بژو ئاڵۆز (قژ، بەرگن).
*v.t.* شتن و سڕینەوە بە گسکی ئیسفنج، یا پەڕۆ: *( to ~ the floor)* .
**mop the floor with ( a person ), [Slang],** بەزاندن؛ گەوزاندن؛ دان بە زەویدا؛ زەوی پێ سڕینەوە.
**mop up, [Colloq.],** (١) تەواوکردن (کار، ئەرك).
(٢) پاکردنەوە لە پاشماوەی لەشکری دوژمنی شکاو:
*( mopping-up operations)*
(٣) [British]، ماشینەوە؛ هەڵ لووشین؛ گسك لێدان.
**mope** (mōp), *v.i.* (١) داخ و خەفەت خواردن؛ دڵتەنگ بوون؛ ئاخ‌وداخ هەڵکێشان: *( He ~s about in the house all day.)* .
(٢) سووڕانەوە؛ گەڕان.
*n.* (١) کەسێکی پەست و بێ تاقەت؛ کەسێکی داخ و خەفەت خۆر؛ غەمگین.
(٢) *( pl )*، پەستی؛ خەفەتباری؛ دڵتەنگی.
**moped** (mōpt), *n.* ماتۆڕسکیلێکی بچووك.
**mopish** (mōp′ish), *adj.* پەست؛ داخ و خەفەت خۆر؛ غەمبار.
**moppet** (mop′it), *n.* منداڵ؛ کچۆلە.
**moquette** (mō-ket′), *n.* ژێرخەری کوڵکن؛ فەرشی تووکن؛ پینەی کوڵکن بۆ ژێرخەری وەها.
**moraine** (mə-rān′, mō-rān′), *n.* بارستێك خۆڵ و بەردو لمی ڕاماڵراو بە ڕوباری سەهۆڵین.
**moral** (môr′əl, mor′əl), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و چەوت؛ هی ڕێ‌ی چاك و خراپ: *( ~ standards; a ~ question)* .
(٢) داوێن پاك؛ ڕاستگۆ؛ پاك؛ ڕەووشت چاك؛ ڕاست:
*( a ~ act; a ~ man; to live a ~ life)*
(٣) ڕێ و ڕەووشتی چاك و خراپ دەزانێ.
(٤) ڕێ و ڕەووشتی چاك یا ڕاست فێرکەر: *( a ~ book)* .
(٥) گیانی *( to give a person ~ support)* .
(٦) هەمان ئەنجام گەیێن وەك شتە ڕاستەقینەکە: *( a ~ victory)* .
(٧) لەو نەیە؛ زۆر بۆی هەیە: *( a ~ certainty)* .
*n.* (١) پەند: *( What is the ~ of the story?)* .
(٢) *( pl. )*، ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و باش؛ ڕاستڕەوی؛ بنچینەی ڕەووشت چاکی؛ ڕەووشتی چاك‌وخراپ: *( His ~s are excellent.)* .
**morale** (mə-ral′, mô-räl′), *n.* وورە؛ گیان؛ گیانی بەرز:
*( The ~ of our troops is high.)*
**moralism** (môr′əl-iz'm, mor′əl-iz'm), *n.* (١) ئامۆژگاری ڕەووشت باشی؛ ئامۆژگاری ڕێ و ڕەووشتی ڕاست گرتن. (٢) پەند.
(٣) ڕێ و ڕەووشتی ڕاست.
**moralist** (môr′əl-ist, mor′əl-ist), *n.* (١) مامۆستای ڕێ و ڕەووشتی ڕاست؛ بیرخەرەوەی ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و چەوت.
(٢) پاك؛ کەسێکی ڕاستڕەو؛ ڕێ و ڕەووشتی ڕاستکر.
**moralistic** (môr′ə-lis′tik, mor′ə-lis′tik), *adj.* زیاد لە پێویست سوور لەسەر پیشاندانی ڕێ و ڕەووشتی چاك و خراپ:
*( His ~ attitude turns people off.)*
**morality** (mô-ral′ə-ti, mə-ral′ə-ti), *n.* (١) ڕاستی و چەوتی کارێك یا کردەوەیەك. (٢) داوێن پاکی؛ پاکی؛ ڕەووشتی جوان؛ ڕەفتاری باش.
(٣) زانستی ڕێ و ڕەووشتی ڕاست؛ بنچینەکانی ڕێ و ڕەووشتی باش.
(٤) پەند (٥) **morality play** .

**morality play,** جۆرە شانۆنامەیەکی سەدەی پانزەهەم و شانزەهەمە دەربارەی ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و چەوت (ئەکتەرەکان وێنەی ڕەووشتی وەك باشی و بەدکاری و شتی تریان دەنوواند).
**moralize** (môr′ə-līz′, mor′ə-līz′), *v.i.* پیشاندانی ڕێ و ڕەووشتی چاك و خراپ لە نووسین و دوواندا (بەتایبەتی زیاد لە پێویست).
*v.t.* (١) (ا) لێکدانەوە لەڕووی ڕاستی و چەوتی‌یەوە.
(ب) پەند لێوە وەرگرتن؛ پیشاندانی پەند.
(٢) پلەی ڕاستڕەوی بەرزکردنەوە؛ ڕاستکردنەوە (ڕەووشت).
-moralization *(n.)*.
**morally** (môr′əl-i, mor′əl-i), *adv.* (١) بە ڕەووشت پاکی؛ بە پاکی؛ بە داوێن پاکی؛ بە ڕاستڕەوی. (٢) لەڕووی ڕەووشت چاکی‌یەوە؛ لەڕووی پاکی‌یەوە؛ لەڕووی ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و چەوتەوە.
**moral philosophy,** فەلسەفەی ڕەووشت؛ زانستی ڕێ و ڕەووشتی ڕاست و چەوت؛ فەلسەفەی ڕێ و ڕەووشتی چاك و خراپ.
**morass** (mô-ras′, mə-ras′, mō-ras′), *n.* (١) زۆنگاو؛ زەلکاو.
(٢) ئاڵۆزی؛ بارێکی ناخۆش گیروگرفتاوی؛ شتێکی سەر لێ شێوێنەر.
**moratorium** (môr′ə-tôr′i-əm, mor′ə-tō′ri-əm), *n.* (١) - وەستاندن یا دواخستنی قەرزدانەوە لەلایەن بانق یا وولاتێکەوە بەپێ‌ی یاسا.
(٢) ماوەی ئەم وەستاندن یا دواخستنە.
(٣) وەستاندن یا دواخستنی کار یا بەرنامە؛ قەدەغە؛ قەدەغەکردن:
*( There is a building ~ in this town.)*
**moratory** (môr′ə-tô′i, mor′ə-tō′ri), *adj.* دواخەر؛ دەسەڵاتی دواخستنی قەرزدانەوە پێدەر: *( a ~ contract)* .
**moray** (môr′ā, mō-rā′), *n.* جۆرە مارماسی‌یەکی ڕەنگاوڕەنگی چاوبرسی‌یە.
**morbid** (môr′bid), *adj.* (١) نەخۆش؛ ناساغ.
(٢) دڵتەنگ؛ بەرچاوتاریك؛ پەست؛ هەمیشە بیرکەرەوە لە شتی ناخۆش:
*( a ~ person, mind, etc.)*
(٣) ناخۆش؛ پیس؛ دڵتەنگکەر؛ ترسناك؛ جەرگبڕ:
*( the ~ details of a story)*
(٤) هی ئەندامی نەخۆش (توێکاری): *( ~ anatomy)* .
**morbidity** (môr-bid′ə-ti), *n.* (١) (ا) نەخۆشی؛ ناساغی.
(ب) دڵتەنگی؛ پەستی؛ بەرچاوتاریکی.
(٢) ڕێژەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لە ناوچەیەك یا وولاتێکدا.
**morbific** (môr-bif′ik), *adj.* دەبێتە هۆی نەخۆشی.
**morbilli** (mor-bil′ī), *n.pl.* = measles.
**mordacious** (môr-dā′shəs), *adj.* (١) توندوتیژ (ووتە)؛ بڕ؛ تیژ؛ بەتەوسەوە. (٢) تفت‌وتاڵ؛ تفت؛ تاڵ؛ توون.
-mordacity *(n.)*.
**mordant** (môr′d'nt), *adj.* (١) توندوتیژ (ووتە)؛ بڕ؛ تیژ
(٢) داڕزێنەر (تێزاب)؛ ژەنگ پێ هەڵهێنەر.
(٣) ڕەنگ چەسپێنەر (خومکاری).
*n.* (١) ماددەی ڕەنگ چەسپێنەر (خومکاری).
(٢) ماددەیەکە وەك تێزاب بۆ کلێشە هەڵکەندن لەسەر کانزا.
*v.t.* ماددەی ڕەنگ چەسپێنەر تێکردن؛ ماددەی خورندە لێدان.
**more** (môr, mōr), *adj.* (١) زیاتر (هەند، پلە)؛ زۆرتر (هەند)؛ پتر.
(٢) زۆرتر (ژمارە)؛ زیاتر (ژمارە).
(٣) هی تر؛ تر؛ کە:
*( There is ~ tea in the tea- pot.; Would you like ~ coffee.)*
*n.* (١) هەندێکی زیاتر؛ بڕێکی زیاتر.
(٢) ژمارەیەکی زیاتر: *( M~ of us are going.)* .
(٣) شتێکی تر؛ هیچی تر: *( M~ cannot be said.)* .
(٤) شتێکی گرنگتر.
*adv.* (١) زۆرتر؛ زیاتر: *( ~ satisfying)* .
(٢) زیاد لەوەش؛ لەوەش بەولاوە؛ جگە لەوەش.

**more and more,** هەتا بێ لە زۆربووندایە؛ لە هەموو کات زیاتر.
**more or less,** (١) تا ڕادەیەک. (٢) کەم تا زۆر؛ نزیکەی.
**no more,** هیچی تر؛ ئیتر بەسە.
**once more,** جارێکی تر؛ دیسانەوە.
**moreen** (mə-rēn′), *n.* قوماشێکی ئەستوورو قایمی خوری یا لۆکەیە (بۆ پەردەو پینەکردنی قەنەفە بەکاردەهێنرێ)
**morel** (mə-rel′), *n.* جۆرێکە لە قارچک
**moreover** (môr-ō′vẽr, mōr-ō′vẽr), *adv.* سەرەڕای ئەوەش؛ زیاد لەوەش؛ هەروەها؛ جگە لەوەش؛ سەرباری ئەوەش.
**mores** (mō′rēz, môr′ēz), *n.pl.* خوونەریتی کۆمەڵایەتی؛ نەریت؛ هەڵوێستی کۆمەڵگەیەک دەربارەی ڕێو ڕەووشتی ڕاستو چەپ:
*( according to the ~ of this soceity)*
**morganatic** (môr′gə-nat′ik), *adj.* تایبەتی بە هێنانی ژنێکی پلەوپایە لە خۆ کەمتر (بە مەرجێک نە ژنەکەو نە ئەو منداڵانەی دەیبێت میراتی وەرنەگرن)
**morgue** (môrg), *n.* (١) مردووخانە؛ جێی دانانی مردووی ڕێکەوتو نەناسراو بۆ ناسینەوەیانو ناشتنیان. (٢) (ا) سەرچاوەی کۆنی ڕۆژنامە کە ژمارەی کۆنو وێنەو شتی تر دەگرێتەوە. (ب) ژووری ئەم سەرچاوانە.
**moribund** (môr′ə-bund′, mor′ə-bənd), *adj.* (١) گیان دەدات؛ لە مردندایە؛ حەریکە دەمرێ. (٢) بەرەو نەمان دەچێ؛ باوی نەماوە؛ کۆنباو؛ لە نەماندایە؛ حەریکە دوایی پێ دێت.
**morion** (môr′i-on′, mō′ri-on′), *n.* کڵاوزرێی بێ لێواری خۆر.
**morion** (môr′i-on′, mō′ri-on′), *n.* جۆرە بەردێکی بەنرخی قاوەیی یا ڕەشباوە؛ " کوارتز " ی قاوەیی یا ڕەشباو.
**Mormon** (môr′mən), *n.* مۆرمەن. ئەندامی کڵێسەو کۆمەڵێکی ئاینی ئەمەریکیە لە ساڵی ١٨٣٠ دا دامەزراوە.
*adj.* مۆرمەنی؛ تایبەتی بە مۆرمەنەکانو ئاینەکەیان.
**morn** (môrn), *n.* [Poetic]. = **morning.**
**morning** (môr′niŋ), *n.* (١) بەیانی
(٢) سەرەتا *( the ~ of life)* .
(٣) (ا) بەرەبەیان؛ شەبەقی؛ مەلابانگدان.
(ب) [M-]، بانوخوای بەرەبەیان؛ بانوخوای شەبەق.
*adj.* هی بەیانی؛ بەیانی؛ هی بەیانیان.
**morning-glory** (môr′niŋ-glôr′i, môr′niŋ-glō′ri), *n.* گوڵە لاولاو
**morning sickness,** دڵ تێکەڵهاتنی بەیانی؛ دڵ تێکەڵهاتنی بەیانیانە تووشی ژنی تازە سکپڕبوو دەبێ بۆ ماوەی چەند مانگێک.
**morning star,** (١) ئەستێرەی بەیان؛ کاروان کوژە؛ ناهی؛ ڤینۆس (٢) ڕووەکێکی گوڵ زەردی کالیفۆرنیایییە.
**Moroccan** (mə-rok′ən), *adj. & n.* مەراکشی.
**moron** (môr′on, mō′ron), *n.* کەسێکی بێ مێشک؛ دەبەنگ.
-**moronic** *(adj.)*; **moronism** *(n.)*; **moronity** *(n.)*.
**morose** (mə-rōs′), *adj.* مڕومۆن؛ گرژ؛ دڵتەنگ؛ بەرچاوتاریک.
-**morosely** *(adv.)*; **moroseness** *(n.)*.
**-morph** (môrf), پاشگرێکە بەمانای شێوەیەکی تایبەتی هەیە.
**morpheme** (môr′fēm), *n.* مۆرفیم بچووکترین پارچەی واتاداری زمانە (زمانەوانی)؛ بچووکترین بەشی واتاداری ووشەیە.
**-morphic** (môr′fik), پاشگرێکە بەمانای؛ شێوەیەکی تایبەتی هەیە.
*( anthropomorphic)*
**morphine** (môr′fēn), *n.* مۆرفین دەرمانی سڕکەرو ئازارکوژ.
**morphinism** (môr′fin-iz′m), *n.* (١) نەخۆشی خووی مۆرفین بەکارهێنانو بۆ تەرک نەکران. (٢) خووی مۆرفین بەکارهێنانو بۆ تەرک نەکران.
**morphogenesis** (môr′fə-jen′ə-sis), *n.* گۆڕانی زیندەوەر لەکاتی گەورەبوونو پەرەسەندنیدا
**morphologist** (môr-fol′ə-jist), *n.* (١) زانای ووشەسازی؛ ووشەساز. (٢) زانای شێوەو پێکهاتنی زیندەوەر.
**morphology** (môr-fol′ə-ji), *n.* (١) زانستی شێوەو پێکهاتنی زیندەوەر. (٢) زانستی پێکهاتنو شێوەی زەوی (زەمینناسی).
(٣) ووشەسازی؛ لێکۆڵینەوەی شێوەو پێکهاتنو مێژووی ووشە.
-**morphological** *(adj.)*.
**morphosis** (môr-fō-sis), *n.* شێوەی پێکهاتنو پەرەسەندنی زیندەوەرێک یا ئەندامەکانی
**-morphous** (môr′fəs), = **morphic.**
**morro** (mor′ō), *n.* گردێکی خڕ؛ تەپۆلکە خڕە.
**morrow** (mor′ō, môr′ō), *n.* [Archaic or Poetic], (١) بەیانی:
*( Good ~ !)*
(٢) سبەینێ؛ ڕۆژی دوایی؛ ڕۆژی دوای ڕووداوێک.
(٣) کاتی دوابەدوای ڕووداوێک.
**Morse code,** شفرەی " مۆرس " بۆ برووسکە ناردن.
**morsel** (môr′s'l), *n.* (١) پارو؛ تیکە؛ پنچک.
(٢) ئەخت؛ تۆسقاڵ؛ پنتک.
(٣) خواردەمەنییەکی خۆش.
*v.t.* دابەشکردن؛ بەش بەش کردن.
**mort** (môrt), *n.* (١) [Obs.] ، مردن؛ کۆچی دوایی.
(٢) فووکردن بە کەڕەنادا پاش پێکان یا کوشتنی نێچیر.
**mort** (môrt), *n.* ژمارەیەکی زۆر؛ گەلێک.
**mortal** (môr′t'l), *adj.* (١) بمر؛ مەرگدار؛ مردنی:
*( Man is ~ .)*
(٢) هی مرۆڤ (کە دەبێ بمرێ)؛ ئادەمیزادی.
(٣) هی ئەم جیهانە یا ژیانە. (٤) هی مردن.
(٥) کوشندە؛ بکوژ: *( a ~ blow, wound, etc.)* .
(٦) گیان کوژ: *( a ~ sin)* .
(٧) خوێنخوار: *( a ~ enemy)* .
(٨) زۆر خراپ؛ بەد؛ ناپەسەند: *( a ~ terror)* .
(٩) [Colloq.]، (ا) زۆر؛ نێجگار؛ لە ئەندازە بەدەر.
(ب) ووشکو دووروودرێژو ناخۆش.
*n.* مرۆڤ؛ ئادەمیزاد.
**mortality** (môr-tal′ə-ti), *n.* (١) مردن؛ مەرگداری.
(٢) مردنی جەماوەری یا بێ شومار (بەهۆی جەنگ، دەرد، یا برسێتییەوە).
(٣) ڕێژەی مردووان؛ ژمارەی مردووانی ناوچەیەک: *( the ~ from disease)*
(٤) هەموو مرۆڤ؛ مرۆڤایەتی؛ توخمی ئادەمیزاد.
(٥) [Obs.]، مردن.
**mortally** (môr′t'l-i), *adv.* (١) بە کوشندەیی؛ کوشندەییانە:
*( He was ~ wounded.)*
(٢) زۆر؛ نێجگار.
**mortar** (môr′tẽr), *n.* (١) دەسکەوان؛ دۆڵ؛ دەسکودۆڵ:
*( ~ and pestle)*
(٢) مەکینەی شت هاڕین یا کوتان.
(٣) تۆپ (جەنگ).
(٤) قوڕوقسڵ؛ قسڵوگەچ؛ چیمەنتۆو لمو ئاوی تێکەڵ کراو.
*v.t.* بە قوڕو قسڵ یا چیمەنتۆو لم قایم کردنو چاک کردن.
**mortgage** (môr′gij), *n.* (١) بارمتە؛ دانانی شتێک بە بارمتە.
(٢) بڕوانامەی بە بارمتە دانان (بەتایبەتی هی خانوو زەویوزار).
*v.t.* (١) بە بارمتە دانانی شتێک بۆ قەرز وەرگرتن (بەتایبەتی خانوو):
*( to ~ one's house)*
(٢) گرەو لەسەرکردن؛ بەڵێندان بە دان:
*( He ~d his future happiness.)*
**mortgagee** (môr′gi-jē′), *n.* بارمتەگر.
**mortgagor, mortgager** (môr′gi-jẽr), *n.* بارمتەدانەر.
**mortician** (môr-tish′ən), *n.* سەرپەرشتی شۆردنو ئامادەکردنو

ناشتنی مردوو

**mortification** (môr´tə-fi-kā′shən), *n.* (١) ڕیَی خۆشی لە خۆ گرتن· سزای خۆ دان بە خۆشی لە خۆ قەدەغەکردن؛ ئارەزوو کوشتن؛ سزای خۆ دان. (٢) ڕیسوایی؛ ڕیسوابوون؛ ڕیسواکردن.
(٣) تیراوی؛ پووکانەوەی ئەندامێکی لەش.
(٤) ڕیسواکەر؛ مایەی شوورەیی.

**mortify** (môr′tə-fī´), *v.t.* (١) سزای خۆ دان بە ئارەزوو کوشتن و خۆشی لە خۆ قەدەغەکردن؛ خواردن و خۆشی لە خۆ بڕین.
(٢) ڕیسواکردن؛ شکاندن.
(٣) تیراوی تووش کردن؛ داڕزاندن یا پووکانەوەی ئەندامێکی لەش.
*v.i.* (١) سزای خۆ دان بە خۆشی لە خۆ قەدەغەکردن؛ خواردن و خۆشی لە خۆ بڕین (٢) پووکانەوەی ئەندامی لەش؛ داڕزان.

**mortise, mortice** (môr′tis), *n.* کونێکە دەکرێتە پارچە دارێکەوە بۆ پیاکردنی زمانەیەک و چەسپاندنی.
*v.t.* (١) لێکدان و چەسپاندن بە کون و زمانە.
(٢) کونکردن بۆ زمانە پیاکردن و قایم کردن.

**mortmain** (môrt′mān), *n.* خانوو زەوی‌وزار دان بە مزگەوت و قوتابخانە بە خێر یا وەقف.

**mortuary** (môr′choo-er´i), *n.* (١) خانەی شتن و ئامادەکردنی مردوو بۆ ناشتن (٢) (ا) میراتی‌یەکە لە کەسێکەوە کە لە گیانەلادا بێ بۆ قەشەکەی (ب) میراتی‌یەکە لە قەشەکەیەوە کە لە گیانەلادا بێ بۆ سەرگەورەکەی.
*adj.* (١) تایبەتی بە مردوو ناشتن.
(٢) مردنی؛ تایبەت بە مردن.

**Mosaic** (mō-zā′ik), *adj.* مووسایی؛ تایبەتی بە مووسا و ئامۆژگاری و فەرمان و یاساکانی.

**mosaic** (mō-zā′ik), *n.* (١) نەخشکاری هەمەچەشن لەسەر دیوار و شووشە و ڕووی تر (٢) نەخشی جۆراوجۆر و ئاڵۆزی سەر دیوار و شووشە و شوێنی تر· وێنەی هەمەچەشن و پارچە پارچەی لێکدراو.
(٣) شتی جۆراوجۆر؛ شتی هەمەچەشن و هەمەڕەنگ.
(٤) نەخۆشی‌یەکە گەڵا پەڵەپەڵاوی و چرچ‌ولۆچ دەکات.
*v.t.* (١) نەخشەی هەمەچەشن کردن؛ وێنەی جۆراوجۆر و هەمەڕەنگ و پارچە پارچە لێکدان. (٢) ڕازاندنەوە بە نەخشە یا وێنەیەکی وەها.
-mosaic *(adj.)*; mosaicist *(n.)*.

**Mosaic law,** یاسای مووسا؛ یاسای جوولەکە کە بە ناوی مووساوە ناسراوە و لە پێنج بەشی یەکەمی ئینجیلدایە.

**Moses** (mō′ziz, mō′zəs), *n.* مووسا؛ پێغەمبەری جوولەکە.

**mosey** (mō′zi), *v.i.* [Slang], ڕۆیشتن؛ چوون؛ پیاسەکردن؛ گەڕان:
*( I will ~ on home.)*

**Moslem** (moz′ləm, mos′ləm), *n.* موسوڵمان
*adj.* موسوڵمانی؛ ئیسلامی.

**Moslem calendar,** ساڵنامەی ئیسلامی یا عەرەبی.

**mosque** (mosk), *n.* مزگەوت

**mosquito** (mə-skē′tō), *n.* مێشوولە

**mosquito net,** پەردەکوللە.

**moss** (môs, mos), *n.* قەوزە
*v.t.* بە قەوزە داپۆشین.

**mossback** (môs′bak´, mos′bak´), *n.* (١) کیسەڵ، ماسی یا گونچکەماسی پیری پشت قەوزاوی. (٢) [Colloq.]، کەسێکی کۆنەپەرست.

**moss-grown** (môs′grōn´, mos′grōn´), *adj.* (١) قەوزاوی؛ بە قەوزە داپۆشراو (٢) کۆنە؛ کۆنەباو؛ کۆنەپەرست.

**mossy** (môs′i, mos′i), *adj.* (١) قەوزاوی؛ بە قەوزە داپۆشراو.
(٢) لە قەوزە دەچێ.

**most** (mōst), *adj.* (١) زۆرترین؛ زیاترین؛ هەرە؛ – ترین:
*( Of the three, he has the ~ money.)*
(٢) زۆربەی؛ بەشی زۆری: *( M~ people think so.)* .
*n.* (١) زۆربەی؛ بەشی زۆری: *( He took ~ of the credit.)* .
(٢) زۆرترین؛ زیاترین؛ – ترین.
*adv.* (١) زیاترین؛ – ترین: *( ~ horrible)* .
(٢) زۆر: *( a ~ beautiful morning)* .
(٣) [Colloq.]، نزیکەی: *( M~ everyone agrees with you.)*
at (the) most, پەڕی ئەوپەڕی؛ بەلای زۆرەوە.
for the most part, بەزۆری؛ زۆربەی جار.
make the most of, ئەوپەڕی سوود لێ وەرگرتن؛ زۆرترین کەڵک لێ وەرگرتن:
*( to make the most of one's opportunities)*

**-most** (mōst), پاشگرێکە بەمانای: هەرە: *( foremost)* .

**mostly** (mōst′li), *adv.* بەزۆری؛ بەشی زۆری.

**mot** (mō), *n.* پەند؛ قسەی نەستەق.

**mote** (mōt), *n.* گەردیلەی تەپ‌وتۆز.

**motel** (mō-tel′), *n.* مۆتێل: ئوتێلی سەرەڕێ؛ ئوتێلی سادەی نزیک ڕێگاوبان و هەندێک جاریش ناوشار (کە بە زۆری خەڵکی ڕەفتەنی لێ دادەبەزێت).

**moth** (môth, moth), *n.* مۆرانە.

**moth ball,** خڕیلەی نەفتالینی مۆرانەکوژ (بۆ جل‌وبەرگ پاراستن).

**moth-eaten** (môth′ē´t'n, moth′ē´t'n), *adj.* (١) مۆرانە خواردوو. (٢) داڕزاو؛ کۆن؛ سوواو؛ بەکار نەماو.
(٣) کۆنەباو؛ کۆن.

**mother** (muth′ēr), *n.* (١) دایک. (٢) دایکە. (٣) سەرچاوە.
(٤) (ا) ئافرەتێکە کە ئەرک و دەسەڵاتی دایکی هەبێت.
(ب) سەرۆکە ژنی دەستگایەکی ئاینی یا پەرستگایەک: *( ~ superior)* .
(٥) دایە: نازناوی ئافرەتێکی بەتەمەنە لەڕووی ڕێزەوە.
(٦) تایبەخۆکانی دایک.
*adj.* (١) دایکی؛ تایبەتی بە دایک: *( ~ love)* .
(٢) زگماکی: *( ~ tongue)* .
*v.t.* (١) منداڵبوون؛ هێنانە جیهانەوە: *( to ~ a child)* .
(٢) چاودێری کردن و بەتەنگەوە هاتن وەک دایک؛ پەروەردەکردن.

**mother** (muth′ēr), *n.* (١) هەوێنی سرکە؛ سەرتوێژی لیقنی شلەی ترشاو (هەروەها پێشی دەوترێ: " mother of vinegar ") .
(٢) [Obs.]، خڵتە.

**mother country,** = motherland.

**motherhood** (muth′ēr-hood´), *n.* (١) دایکایەتی؛ دایکێتی؛ دایکی. (٢) تایبەخۆکانی دایک. (٣) دایکان.

**mother-in-law** (muth′ēr-'n-lô´), *n.* خەسوو.

**motherland** (muth′ēr-land´), *n.* (١) نیشتمان.
(٢) نیشتمانی باووباپیر.

**motherly** (muth′ēr-li), *adj.* دایکانە؛ دایکی؛ وەک دایک؛ بەڕەحم.
*adv.* هەر وەک دایک؛ دایکانە.
-motherliness *(n.)*.

**mother-of-pearl** (muth′ēr-əv-pūrl′), *n.* ماددەیەکی ڕەنگاو– ڕەنگە بە بەری قاقڵەی هەندێ گیانداری ئاوی‌یەوەیە قۆپچەو خشڵی لێ درووست دەکرێ.

**mother of vinegar,** هەوێنی سرکە؛ سەرتوێژی لیقنی شلەی ترشاو.

**Mother's Day,** جەژنی دایک (کە دووەم یەک شەممەی مانگی جۆزەردە).

**mother superior,** سەرەک ئافرەتی پەرستگای ژن.

**mother tongue,** زمانی دایک؛ زمانی زگماکی.

**mother wit,** زیرەکی زگماکی؛ هەست‌وهۆش.

**mothy** (môth′i, moth′i), *adj.* (١) مۆرانە تێی داوە.
(٢) مۆرانە خواردوو.

**motif** (mō-tēf′), *n.* (١) بیر یا مەبەستی بەرهەمێکی وێژەیی یا هونەری زوو زوو دووپات کراوە. (٢) بیری بنچینەیی یا سەرەکی.

(٣) نەخشەیەکی زۆر دووپات کراوە (خانووسازی، رازاندنەوە).

**motile** (mō′t'l, mō′til), *adj.* بزۆك (زیندەوەرزانی)؛ خۆبزوێن.

**motility** (mō-til′ə-ti), *n.* بزۆکی (زیندەوەرزانی)؛ خۆبزوێنی.

**motion** (mō′shən), *n.* (١) بزووان، بزواندن؛ جووڵە؛ جووڵانەوە

(٢) رەوت. (٣) توانای بزووان؛ توانای جووڵانەوە هەبوون.

(٤) هێما؛ جووڵانەوەی دەست و چاو بۆ بیروڕا دەربڕین. (٥) مەیل؛ ویست.

(٦) پێشنیار (بۆ دەنگ لەسەر دان لە کۆڕ یا ئەنجوومەندا).

(٧) داوای فەرمان دەرکردن (دادگا).

(٨) سەرجەمی ئامێری بزۆك (مەکینەکاری).

(٩) گۆڕینی بەرزو نزمی ئاوازی مۆسیقا.

*v.i.* دەست یا چاو جووڵاندنەوە بۆ نیشانە پێدان.

*v.t.* پێ ووتن بە بزواندنی دەست یا چاو؛ نیشانە پێدان بە جووڵەی دەست یا چاو

**in motion,** لە گەڕاندایە؛ دەجووڵێ؛ لە جموجووڵدایە

**put (set) in motion,** خستنەکار؛ خستنە جموجووڵ؛ بزواندن؛ خستنەگەر. *( The plan was put in motion.)*

**motionless** (mō′shən-lis), *adj.* نەبزۆك؛ وەستاو؛ بێ جووڵە؛ جووڵەنەکەر

**motion picture,** سینەما؛ فیلمی سینەما.

**motivate** (mō′tə-vāt´), *v.t.* هاندان؛ پاڵ پێوەنان؛ بزواندن.

**motivation** (mō′tə-vā′shən), *n.* هاندەر؛ پاڵنەر؛ پاڵ پێوەنان.

**motive** (mō′tiv), *n.* (١) پاڵنەر؛ هۆکار؛ بزوێنەر؛ مەرام؛ *( We despise those who act from low or selfish ~s .)*

(٢) motif

*adj.* بزوێنەر؛ بزوێن.

*v.t.* هاندان؛ پاڵ پێوەنان.

**ulterior motive,** مەرامی دوور؛ مەرامی شاراوە.

**-motive** (mō′tiv), پاشگرێکە بەمانای بزۆك؛ بزوان؛ تایبەت بە بزوان *( automotive, locomotive)*

**motiveless** (mō′tiv-lis), *adj.* بێ مەرام

**motive power,** (١) هێزی بزوێن (هەڵم، ئەلەکتریك... هتد).

(٢) مەکینەکانی شەمەندەفەرێك

(٣) هێزی پاڵپێوەنەر؛ هێزی جووڵێنەر.

**motivity** (mō-tiv′ə-ti), *n.* هێزی بزواندن

**mot juste** (mō´zhüst′), [Fr.], ووشەی پڕ بە پێز؛ ووشەی تەواو؛ ووتەی گونجاو

**motley** (mot′li), *adj.* (١) هەمەرەنگ؛ خاڵ خاڵ؛ *( a ~ coat)* .

(٢) بەرگی هەمەرەنگ لەبەرکەر *( a ~ fool)*

(٣) هەمەجەشن؛ تێکەڵاو *( a ~ crowd, group, etc.)* .

*n.* (١) قوماشی هەمەرەنگ یا خاڵ خاڵ

(٢) بەرگی هەمەرەنگ (کە قەشمەرچی لەبەری دەکرد بەتایبەتی هی کۆشکی شاهانەی کۆن؛ (٣) [Obs.] قەشمەری کۆشکی شاهانەی کۆن؛ قەشمەر.

**motmot** (mot′mot), *n.* باڵندەیەکی ناوچە گەرمەکانی ئەمەریکایە لە توخمی قەلەباچکە

**motor** (mō′tēr), *n.* (١) مەکینە؛ ماتۆڕ؛ بزوێنەر؛ مەکینە بزوێن

(٢) ئوتومبێل.

*adj.* (١) بزوێن؛ تایبەتی بە مەکینە بزوێن.

(٢) مەکینەی هەیە؛ بە مەکینە دەڕوات *( a ~ vehicle; a ~ -boat)*

(٣) بە ئوتومبێل *( a ~ trip)*

(٤) تایبەتی بە هەستەدەماری ماسولکەبزوێن

*v.i.* بە ئوتومبێل گەڕان؛ بە ئوتومبێل چوون یا گەشتکردن.

**motorbike** (mō′tēr-bīk´), *n.* [Colloq.], ماتۆڕسکیل؛ ماتۆڕ.

**motorboat** (mō′tēr-bōt´), *n.* بەلەمی ماتۆڕ

**motorbus** (mō′tēr-bus´), *n.* پاس؛ پاسی کاروان

**motorcade** (mō′tēr-kād´), *n.* ڕۆیشتنی چەند ئوتومبێلێك پێکەوە.

**motorcar** (mō′tēr-kär´), *n.* ئوتومبێل.

**motorcycle** (mō′tēr-sī´k'l), *n.* ماتۆڕسکیل.

*v.i.* سواری ماتۆڕسکیل بوون.

**motorcyclist** (mō′tēr-sī´klist), *n.* ماتۆڕسکیلچی.

**motorist** (mō′tēr-ist), *n.* ئوتومبێل لێخوڕ؛ ئوتومبێلچی (بەتایبەتی هی ئوتومبێلی خۆ نەك بە پیشە).

**motorize** (mō′tēr-īz´), *v.t.* (١) بە ئوتومبێل یا بە مەکینەکردن لەباتی گالیسکەو ئەسپ. (٢) مەکینە خستنە سەر؛ مەکینە لێ بەستن.

**motorman** (mō′tēr-mən), *n.* لێخوڕی پاسی ئەلەکتریکی ناوشار یا ترام؛ لێخوڕی شەمەندەفەری ئەلەکتریکی ژێرزەمین.

**motor scooter,** ماتۆڕسکیلی بچووك.

**mottle** (mot′'l), *v.t.* خاڵ خاڵ کردن؛ پەڵەپەڵاوی کردن؛ رەنگاورەنگ کردن.

*n.* (١) خاڵ؛ خاڵ خاڵ؛ پەڵەی رەنگاورەنگ.

(٢) نەقشی خاڵ خاڵاوی، پەڵەپەڵە، یا رەنگاورەنگ (وەك هی مەرمەر).

**mottled** (mot′'ld), *adj.* خاڵ خاڵ؛ خاڵ خاڵاوی؛ پەڵەپەڵاوی؛ رەنگاورەنگ.

**motto** (mot′ō), *n.* درووشم.

**mouch** (mōōch), *v.i. & v.t.* = mooch.

**mouflon, moufflon** (mōōf′lon), *n.* جۆرێکە لە مەڕەکێوی.

**moulage** (mōō-läzh′), *n.* (١) لەقاڵبدان بۆ ناسینەوە (بەتایبەتی شوێن پێ و شوێن پەنجە). (٢) قاڵبێکی وەها.

**mould** (mōld), *n., v.t. & v.i.* [Chiefly British], = mold.

**moulding** (mōl′diŋ), *n.* = molding.

**mouldy** (mōl′di), *adj.* = moldy.

**mound** (mound), *n.* (١) سەنگەری لم و خۆڵ. (٢) تەپۆلکە؛ گردۆلکە.

(٣) بەستوو؛ بەستەك؛ بارست.

(٤) ئەو نەختە بەرزاییەیە کە تۆپهاوێژی لەسەر دەوەستێ (یاری بێسبۆڵ).

*v.t.* (١) سەنگەری خۆڵ و لم بەدەوردا درووستکردن.

(٢) کەڵەکەکردن؛ گردکردنەوە؛ کۆمەڵ کردن.

**mount** (mount), *n.* (١) شاخ؛ چیا؛ گرد؛ *( M~ Everest)* .

(٢) [Obs.]، سەنگەری بەرز؛ بەستوو.

(٣) بەشە گۆشتنەکانی بەری لەپ.

**mount** (mount), *v.i.* (١) ( ~ up )، پیا هەڵگەڕان؛ پیا سەرکەوتن.

(٢) سواربوون. (٣) زۆربوون؛ زیادبوون؛ لە زیادبووندایە؛ *( The number of casualties was ~ing.)*

*v.t.* (١) پیا سەرکەوتن؛ سەرکەوتن؛ *( She ~ed the stairs.)* .

(٢) (ا) سواربوون (ئەسپ، کەر، هێستر)؛ *( He ~ed his horse.)*

(ب) چوونە سەر (سەکۆ، کورسی).

(٣) سواربوون (ئافرەت، گیاندار بۆ جووت بوون).

(٤) خستنەسەرو قایم کردن؛ لەسەر دانان و چەسپاندن؛ *( He ~ed the statue on a pedestal.)*

(٥) تێخستن و چەسپاندن؛ خستنەسەرو قایم کردن؛ *( to ~ a picture)* .

(٦) گردنەبەری پەیکەری جلوبەرگ و نواندنی؛ پیشاندان.

(٧) (ا) ڕاستکردنەوەو لە شوێنی خۆدا چەسپاندن و ئامادەکردن؛ *( to ~ a gun)*

(ب) هەبوون (چەك)؛ *( This ship ~s six cannon.)* .

(ج) دانان بە پاسەوان. (د) نۆرەی پاسەوانی کردن.

*n.* (١) سواربوون (ئەسپ)؛ شێوەی سواربوون.

(٢) شتێك کە بۆ سواربوون بێ (ئەسپ، پاسکیل).

(٣) سواربوونی ئەسپی پێشبڕکێ. (٤) پاڵپشت.

**mountain** (moun′t'n), *n.* (١) شاخ؛ چیا؛ کەژ؛ کێو.

(٢) (*pl.*)، زنجیرە شاخ. (٣) بەستەك؛ بارست؛ کۆمەڵێکی گەورە؛ تۆپەڵێکی زل.

*adj.* (١) شاخی؛ چیایی. (٢) زۆر زل.

**mountain cat,** (١) وێز. (٢) پشیلەکێوی.

**mountain chain,** زنجیرە شاخ؛ ریزە شاخ.
**mountain dew,** [Colloq.], (١) ویسکی
(٢) ویسکی بە قاچاخ دروستکراو.
**mountaineer** (moun′t'n-êr′), *n.* (١) شاخ نشین
(٢) شاخەوان
*v.i.* شاخەوانی کردن.
**mountain goat,** بزنەکێوی
**mountain lion,** شێری ئەمەریکی؛ وێز.
**mountainous** (moun′t'n-ɔs), *adj.* (١) شاخاوی؛ چیایاوی؛
شاخوداخاوی. (٢) زۆر زل؛ زۆر گەورە.
**mountain range,** زنجیرە شاخ؛ ریزە شاخ.
**mountain sheep,** مەڕەکێوی
**mountain sickness,** گێژی شاخ؛ سەرەخولێی سەر شاخ.
**mountebank** (moun′tə-baŋk′), *n.* (١) دەرمانفرۆشی ساختەباز
(لە شوێنێکی گشتیدا) (٢) کەسێکی ساختەباز
**mounted** (moun′tid), *adj.* (١) سوار (ئەسپ، پاسکیل)؛ سواربوو
(٢) سوارە *( ~ police)*.
(٣) داگیراوە (تفەنگ)؛ ئامادە بۆ بەکارهێنان؛ لەسەر پەلەپیتکەیە: *( a ~ gun)*.
(٤) خراوەسەرو چەسپێنراو بۆ لەچوارچێوەگرتن.
(٥) بزۆک؛ هۆی گواستنەوەی هەیە (سوپا).
**mounting** (moun′tiŋ), *n.* (١) سواربوون
(٢) پاڵپشت (وێنە لەچوارچێوەگرتن).
**mourn** (môrn, mōrn), *v.i.* (١) شینکردن؛ شیوەنکردن؛ بۆ گریان؛
داخ بۆ خواردن. (٢) ڕەش پۆشین؛ جلی ڕەش لەبەرکردن. (٣) خوێندن (کۆتر).
*v.t.* (١) شیوەن بۆ کردن؛ شین بۆ کردن؛ بۆ گریان. (٢) داخ بۆ خواردن.
**mourner** (môr′nẽr, mōr′nẽr), *n.* شیوەنکەر؛ کەسێکە کە
لە پرسەدا بەشداری دەکات.
**mournful** (môrn′fəl, mōrn′fəl), *adj.* (١) شیوەنی؛ پرسەیی.
(٢) غەمگین؛ دڵگیر؛ بەسۆز. *( a ~ song, sound, etc.)*.
**mourning** (môr′niŋ, mōr′niŋ), *n.* (١) شیوەن؛ شین
(٢) جلوبەرگی ڕەش؛ پۆشاکی ڕەش (٣) ماوەی ڕەشپۆشی یا شین.
**mouse** (mous), *n.* (١) مشک (٢) (أ) کچ (لەڕووی خۆشەویستییەوە).
(ب) کەسێکی ترسنۆک و نالەبار. (٣) [Slang]، چاو شین بوونەوە (لە ئەنجامی
لێداندا). (٤) جۆرێکە لە گرێ (کەشتییەوانی).
*v.i.* (١) ڕاوە مشک کردن؛ مشک گرتن.
(٢) بە دزییەوە بۆ گەڕان؛ بە خشپە بەدوادا گەڕان.
**mouser** (mou′zẽr), *n.* پشیلەی مشکگر
**mousetrap** (mous′trap′), *n.* تەڵەی مشک
**mousey** (mou′si, mou′zi), *adj.* = mousy.
**mousse** (mōōs), *n.* مووس (جۆرە شیرینییەکە لە شیری خەستی
شڵەقێنراو و سپێنەی هێلکەو شەکر دروست دەکرێ.
**mousseline** (mōōs lēn′), *n.* [Fr.], (١) muslin.
(٢) جۆرە شووشەیەکی نەقش لەسەر کراوە.
**moustache** (məs-tash′, mus′tash), *n.* = mustache.
**mousy** (mou′si, mou′zi), *adj.* (١) لە مشک چوو؛ بێ دەنگ؛ ترسنۆک
(٢) پڕە لە مشک؛ مشک تێی داوە
**mouth** (mouth), *n.* (١) دەم؛ زار (٢) لێو؛ لچ و لێو؛ دەم و لێو.
(٣) کەس (کە دەبێ بژێنرێ یا خواردنی بدرێتێ):
*( He has four ~s to feed.)*
(٤) (أ) ڕێژگەی ڕووبار (ب) دەمی دەفر.
(ج) دەمی لوولەی چەکی ئاگرین.
(د) دەمی گیرە یا مەنگەنە. (ه) دەمی کەڕەنای.
*v.t.* (١) وتن؛ دەربڕین (بەتایبەتی بە خۆنوواندنەوە)؛ ووتاردان.
(٢) خستنە دەمەوە (٣) دەم پیاهێنان؛ دەم و لێو پیاهێنان.
(٤) ئەسپ ڕاهێنان بە لغاو
*v.i.* (١) ووتن؛ دەربڕین (بەتایبەتی بە خۆ نوواندنەوە)؛ ووتاردان.
(٢) دەم و چاو گرژکردن.
**down in ( or at ) the mouth,** [Colloq.]، پەست؛ غەمبار؛ خەفەتبار.
**give mouth to,** ووتن؛ دەربڕین؛ ووتاردان.
**have a big mouth,** [Slang], دەم درێژی کردن؛ زمان درێژی کردن؛
دەم لێ کردنەوە.
**mouthful** (mouth′fool′), *n.* (١) پڕ بە دەم. (٢) پاروو؛ تیکە.
(٣) نەخت؛ تۆز.
(٤) [Colloq.]، ووشە یا ووتەیەکی دوورودرێژ (کە بە ئاسانی نابێژرێ).
(٥) [Slang]، ووتەیەکی بەجێ: *( say a ~ )*.
**mouthpiece** (mouth′pēs′), *n.* (١) ئەو بەشەی دەنرێ بە دەمەوە
یا دەخرێتە ناو دەمەوە:
*( the ~ of a telephone, of a pipe, of a horse's bit, etc.)*
(٢) ئەو بەشەی ئامێرێکی مۆسیقییە کە دەمی پێوە دەنرێ (وەک شمشاڵ؛
(٣) دەم ڕاستی دەستە، کۆمەڵە، یا حیزبێک.
(٤) [Slang]، پارێزەری تاوانکاران.
**mouthy** (mouth′i, mouth′i), *adj.* زۆروێژ؛ هەڵەوەڕ؛ فشەکەر.
**movability** (mōōv′ɔ-bil′ə-ti), *n.* توانای جوولاندن هەبوون.
**movable, moveable** (mōōv′ɔ-b'l), *adj.* (١) دەجوولێنرێ؛
دەتوانرێ بجوولێنرێ (سامان)؛ دەبزوێنرێ؛ هەڵدەگیرێ: *( ~ property)*
(٢) دەگوێزرێتەوە؛ لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێ: *( ~ holidays)*
*n.* (١) شتێک کە بتوانرێ بجوولێنرێ.
(٢) *(pl.)*، سامانی هەڵگرتەنی کەسێک خۆی (بەتایبەتی کەرەسەی ناومال؛
**move** (mōōv), *v.t.* (١) گواستنەوە؛ گوێزانەوە (٢) بزواندن؛ جوولاندن.
(٣) والێکردن؛ پاڵ پێوەنان
(٤) خستنە جم و جووڵ؛ هێنانە جۆش:
*( He ~d the crowd with his speech.)*
(٥) پێشنیازکردن (لە کۆڕ یا ئەنجوومەنێکدا بۆ دەنگدان لەسەر).
(٦) گووپێکردن؛ پیسایی پێکردن.
(٧) فرۆشتن: *( to ~ the merchandise)*
*v.i.* (١) جوولان؛ بزوان؛ چوون؛ ڕۆیشتن.
(٢) گواستنەوە (بۆ ماڵ یا شاری تازە)؛ گوێزانەوە؛ بارکردن:
*( They ~d last month.; We will ~ to our new house.)*
(٣) هەڵسان و دانیشتن؛ ژیان؛ جم و جووڵ کردن:
*( We ~ in good society.)*
(٤) پێشکەوتن.
(٥) کەوتنەخۆ؛ جمان؛ کارکردن؛ بە کار هەڵسان.
(٦) گەڕان (مەکینە)؛ کارکردن.
(٧) داواکردن: *( to ~ for a new trial)*.
(٨) پیسایی کردن؛ گووکردن؛ بەتاڵبوونەوە.
(٩) [Colloq.]، ( ~ on )، دەستکردن بە ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتن:
*( Let's be ~ing on.)*
(١٠) جوولاندن (داشی دامە و شەترەنج).
(١١) فرۆشتن.
*n.* (١) جوولە؛ جوولانەوە؛ جمە. (٢) هەنگاو (بەرەو ئامانج).
(٣) گواستنەوە (ماڵ)؛ گوێزانەوە.
(٤) جوولان (داشی دامە و شەترەنج)؛ نۆرە (یاری)
**get a move on,** [Slang], (١) بزوان؛ جوولان؛ جمان (٢) پەلەکردن.
**on the move,** [Colloq.], گەڕۆک؛ هەمیشە لە جم و جووڵدایە
**moveable** (mōōv′ə-b'l), *adj.* = movable.
**movement** (mōōv′mənt), *n.* (١) جوولە؛ جوولانەوە؛ بزوان.
(٢) هاتوچۆ؛ هاتن و چوون؛ جم و جووڵ.
(٣) پیسایی؛ گوو: *( bowel ~ )*.
(٤) مناوەرە (سوپا). (٥) ڕەوت؛ لەنجە؛ چۆنێتی جوولانەوە.
(٦) بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی یا ڕامیاری.

(۷) ڕوودان (چیرۆك، شانۆنامە). (۸) مەیل؛ جموجووڵ بە لایەکی تایبەتیدا.
(۹) گۆڕانی نرخی فرۆتەنی. (۱۰) پارچە بزۆکەکانی مەکینەیەك.
(۱۱) (أ) خێرایی مۆسیقا. (ب) کێشی مۆسیقا. (ج) بەشێکی سەمفۆنیا.
(۱۲) کێشی هۆنراوە

**mover** (mōōv'ẽr), ***n.*** (۱) کەرۆك. (۲) گوێزەرەوە (بەتایبەتی کەسێك کە پیشەی گواستنەوەی شتومەکی خەڵك بێت).

**movie** (mōōv'i), ***n.*** [Colloq.], (۱) فیلمی سینەما. (۲) سینەما.

**the movies,** (۱) پیشەسازی سینەما. (۲) فیلمی سینەما. (۳) سینەماکان.

**moviegoer** (mōōv'i-gō'ẽr), ***n.*** [Colloq.], کەسێك کە زوو زوو دەچێتە سینەما

**movie house,** [Colloq.], سینەما

**moving** (mōōv'iŋ), ***adj.*** (۱) بزۆك؛ جووڵاوە. (۲) بزوێنەر؛ جووڵێنەر. (۳) هەست بزوێن؛ هەست جووڵێنەر.

**moving picture,** فیلمی سینەما

**moving staircase** ( or **stairway** ), = **escalator.**

**mow** (mō), ***v.t.*** (۱) چیمەن برین؛ برین (چیمەن، گیا)؛ دوورینەوە ***( to ~ a lawn)***
(۲) (~ **down**). قەلاچۆکردن؛ بە کۆمەڵ کوشتن؛ ماکۆدان؛ دروێنەکردن (مەجاز). ***( We ~ed down the enemy.)***

***v.i.*** چیمەن برین؛ گیا برین

**mow** (mou), ***n.*** (۱) گوورزە. (۲) کایەن

**mow, mowe** (mou, mō), ***n. & v.i.*** [Archaic], دەموچاو گرژ کردن؛ خۆ مۆنکردنەوە.

**mower** (mō'ẽr), ***n.*** چیمەنبڕ. مەکینەی چیمەن برین.

**mown** (mōn), *alternative past participle of* **mow**.

**mozzetta, mozetta** (mō-zet'ə), ***n.*** چاکەتێکی کورتی تەپلەدارە پاپاو سەرەك قەشەکان لەبەری دەکەن

**Mr.** (mis'tẽr), *plural*. **Messrs., = mister.**

**Mrs.** (mis'iz), *plural* **Mmes.,** خانم؛ خاں: نازناوی ئافرەتی مێرددارە.

**MS.** (mis), خانم؛ خان: نازناوی ئافرەتە، مێرددار بێ یا بێ مێرد.

**M.S.,** = **Master of Science.,** بڕوانامەی ماستەری زانیاری

**M.Sc.,** = **Master of Science.,** بڕوانامەی ماستەری زانیاری

**much** (much), ***adj.*** زۆر (بۆ شتی نەژمێردراو)؛ گەلێك؛ ئەوتۆ. ***( ~ rain, money, food, etc.)***

***adv.*** (۱) زۆرتر؛ زیاتر؛ زۆر؛ گەلێك. ***( He is ~ happier now.)***
(۲) نزیکەی؛ کەم تا زۆر. ***( He is ~ the same as yesterday.)***

***n.*** (۱) بڕێکی زۆر؛ هەندێکی زۆر. ***( There is ~ to be done.)***
(۲) شتێکی سەرنجڕاکێش، لێهاتوو، یا گرنگ. ***( As a leader, he is not ~ .)***

**as much again,** دوو ئەوەندە

**as much as,** ئەوەندەی

**make much of,** زۆر بە گرنگ دانان؛ زل کردن؛ زۆر گوێ پێدان؛ زیاد لە پێویست گەورەکردن.

**think much of,** زۆر ڕێزلێگرتن.

**mucid** (mū'sid), ***adj.*** (۱) کەڕوواوی. بۆندار. (۲) لینج.

**mucilage** (mū's'l-ij), ***n.*** (۱) سرێش؛ جیوە.
(۲) ماددەیەکی لینجی جەلاتینییە لە هەندێ ڕووەکدا هەیە.

**muck** (muk), ***n.*** (۱) پەینی تازە؛ پەینی شێدار.
(۲) پیسی؛ پیسایی؛ لیخە.

***v.t.*** (۱) پەیناوکردن؛ پەین تێکردن. (۲) [Colloq.]، پیسکردن؛ لیخنکردن.
(۳) پاکردنەوە. کانزای خاو.

**make a muck of,** تێکدان (کار)؛ بە نەزانانە کردن و تێکدان

**muck about,** [Chiefly British], [Colloq.], خۆخلافاندن؛ کات بەفیڕۆدان

**muck up,** [Colloq.], (۱) پیس و پۆخل کردن.
(۲) تێکدان (نەخشە، پلان)؛ شێواندن.

**mucker** (muk'ẽr), ***n.*** [British Slang], کەسێکی نزم یا ناکەس؛ کەسێکی کاڵ و کرچ.

**muckamuck** (muk'ə-muk), ***n.*** [Slang], کەسێکی خۆ بە زل زان؛ پیاوی گەورە (لەڕووی لاقرتێوە).

**muckrake** (muk'rāk'), ***v.i.*** شتی پیس و خراپ دۆزینەوە لەسەر کەسانی بەناوبانگ و کاربەدەستانی میری و بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەدا؛ ناوپیس کردن؛ دەرخستنی ڕەووشت و کردەوەی ناپەسەندی کەسانی ناودار

**-muckraker** ***(n.).***

**muckworm** (muk'wũrm'), ***n.*** کرم یا کرمۆکەی ناو شیاکەو پیسایی.

**mucky** (muk'i), ***adj.*** پیس؛ پیس و پۆخل؛ لیخن

**muco-, muc-** (mū'kō, mū'kə), پێشگرێکە بەمانای: (أ) چلم؛ ڕیپۆق. (ب) پەردەی چلمین؛ لینجە پەردە.

**mucosa** (mū-kō'sə), ***n.*** = **mucous membrane.**

**mucous** (mū'kəs), ***adj.*** (۱) چلمین؛ چلمی؛ چلم دەردەر. (۲) لینج.

**-mucousity** ***(n.).***

**mucous membrane,** پەردەی چلمین؛ لینجە پەردە.

**mucus** (mū'kəs), ***n.*** چلم؛ ڕیپۆق؛ هەر ماددەیەکی لینجی وەك چلم کە لەش دەری بدات.

**mud** (mud), ***n.*** (۱) قوڕ؛ لیتە؛ قوڕولیتاو.
(۲) قسەی سووك؛ بوختان؛ لەکە؛ قسەی خراپ (کە بخرێتە دوای یەکێك)

***v.t.*** قوڕاوی کردن؛ پیس کردن.

**throw** (or **fling**) **mud at,** ناوزڕاندن؛ ناوپیس کردن؛ بەدناوکردن؛ لەکەدارکردن.

**mud bath,** خۆ لە قوڕولیتەی کانزاوی هەڵکێشان (بۆ چارەسەری باداری)؛ گەرماوی قوڕولیتەی کانزاوی.

**mud cat,** جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە.

**muddiness** (mud'i-nis), ***n.*** قوڕاویتی؛ لیخنێتی؛ لێڵێتی.

**muddle** (mud''l), ***v.t.*** (۱) تێکدان (کار)؛ تێکەڵاوو پێکەڵاوکردن؛ شێواندن. (۲) خواردنەوە تێکەڵاوکردن یا تێکدان. (۳) لێڵ کردن.
(٤) سەر لێ تێکدان (بە خواردنەوەی سەرخۆشکەر)؛ سەر لێ شێواندن.
(٥) سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێواندن؛ مێشك تێکدان.

***v.i.*** سەر لێ شێوان؛ سەر لێ تێکچوون؛ تێکەڵ و پێکەڵ بوون.

***n.*** (۱) تێکەڵاوو پێکەڵاوی؛ شێواوی. (۲) سەر لێ تێکچوون؛ سەر لێ شێواوی.

**muddle through,** هەرچۆنێك بێت بە ئەنجام گەیاندنی کارێك لەگەڵ هەڵەو تێکەڵاوو پێکەڵاویشدا؛ جێبەجێکردنی کارێك بە زەحمەت.

**muddle-headed** (mud''l-hed'id), ***adj.*** بێ مێشك؛ کەودەن؛ سەر لێ شێواو.

**muddy** (mud'i), ***adj.*** (۱) قوڕاوی. (۲) لیخن؛ لێڵ.
(۳) لێڵ؛ تێکەڵاوو پێکەڵاو؛ شێواو. ***( ~ thinking)***

***v.t. & v.i.*** قوڕاوی کردن؛ قوڕاوی بوون؛ لێڵ کردن؛ لێڵ بوون؛ لیخن بوون. ***( to ~ the water, the situation, etc.)***

**mudfish** (mud'fish'), ***n.*** ماسییەکی ناو قوڕولیتەو ئاوی لیخنە.

**mudguard** (mud'gärd'), ***n.*** کڵاوەی پێنچکەی پاسکیل و ئوتومبیل (بۆ فڕێ نەدانی قوڕ بەملاو بەولادا).

**mud hen,** مریشکی زەلکاو.

**mudhole** (mud'hōl'), ***n.*** چاڵەقوڕ (لە ڕێگاو بانەدا).

**mud pie,** حەمامۆکە.

**mud puppy,** قوڕناوێلکە.

**mudsill** (mud'sil'), ***n.*** مووڕەداری بناغەی خانوو.

**mudslinger** (mud'sliŋ'ẽr), ***n.*** ناوپیسکەر بە ناڕەوا (بەتایبەتی ناحەزان و هاوچاوانی ڕامیاری لەکاتی هەڵبژاردندا)؛ ناوزڕێن؛ بوختانچی

**-mudslinging** ***(n.).***

**mudstone** (mud'stōn'), ***n.*** بەردی گڵین (کە هەوای بەرکەوت دەپرووێ).

**mud turtle,** کیسەڵی ناو قوڕولیتە.
**muezzin** (mū-ez′in), *n.* بانگدەر
**muff** (muf), *n.* (١) دەسکێش؛ دەسکێشێکە شوێنی پەنجەکانی بە جیاجیا نین بەڵکو هەمووی یەك خانەیە. (٢) (ا) تۆپ نەگرتنەوە (یاری بێسبۆڵ). (ب) کارێکی ناقۆڵا و نەشارەزایانە؛ تێکدانی کار لەبەر نەزانین. (ج) ناقۆڵاکار؛ ناکارامە؛ کارتێکدەر.
***v.t. & v.i.*** بە ناکارامەیی کردن (وەرزش)؛ بە ناقۆڵایانەو نەزانانەکردن.
**muffin** (muf′in), *n.* خەپلەنانی نەستووروو بچووك؛ کێکی بچووك.
**muffle** (muf′′l), *v.t.* (١) ( ~ up )، داپۆشین بە (ملپێچ، بەتانی، یا پاڵتۆ)؛ پێچانەوە (لەبەر سەرما). (٢) دەم هەڵبەستن؛ دەموچاو هەڵبەستن؛ چاو بەستنەوە؛ دەماخ کردن. (٣) کپ کردن؛ دەنگ لێ برین: ***( to ~ a sound, an explosion, etc.)***
***n.*** (١) دەم هەڵبەست؛ چاوبەست. (٢) دەنگ کپکەر؛ خەفەکەر. (٣) فرنێکە بۆ سوورکردنەوەی گۆزەودیزە بەبێ بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی گڕی ئاگرەکە
**muffler** (muf′lẽr), *n.* (١) دەم هەڵبەست؛ ملپێچ (٢) کپکەرە؛ دەنگ خەفەکەری ئەگزۆسی ئوتومبیل
**mufti** (muf′ti), *n.* (١) موفتی (ئاینی ئیسلام). (٢) بەرگی مولکی (بەتایبەتی لەبەری یەکێکدا کە هەمیشە بەرگی سوپایی لەبەرکردبێ
**mug** (mug), *n.* (١) کووپی ئەختێك قورس و گەورەی چاو قاوە (جاران وێنەی دەموچاوێکی لەسەر دەکرا). (٢) پڕ کووپێکی وەها. (٣) [Slang]، (ا) دەموچاو. (ب) دەم. (ج) لچ هەڵقورتان؛ مۆنی؛ ڕووی گرژ. (د) کەسێکی قسەڕەقی بێ ئەزاکەتی نەزان.
***v.t.*** [Slang], (١) وێنەگرتن (بەتایبەتی هی تاوانکارێك لەلایەن پۆلیسەوە). (٢) پەلاماردان لە پشتەوەو دەست خستنە بینەقاقا بەنیازی ڕووتکردنەوە.
***v.i.*** [Slang], (١) دەموچاوی خۆ گرژکردن یا شێواندن لە دەمەلاسکێدا (بەتایبەتی لەسەر شانۆ). (٢) پەلاماردان لە پشتەوەو دەست خستنە بینەقاقا بەنیازی ڕووتکردنەوە.
**mugger** (mug′ẽr), *n.* [Slang], (١) ڕووتکەرەوە (بەتایبەتی کە پەلاماری کەسێك دەدات لەدواوەو دەست دەخاتە بینەقاقای). (٢) ئەکتەرێکە دەموچاوی خۆی گرژ دەکات یا دەشێوێنێ لە دەمەلاسکێدا لەسەر شانۆ.
**muggy** (mug′i), *adj.* گەرم و شێدار (ئاووهەوا)؛ بۆخە: ***( ~ weather)***
**-mugginess** ***(n.).***
**Muhammadan** (moo-ham′əd-ən), ***adj. & n.*** موسوڵمان (هەروەها " **Muhammedan** ").
**mulatto** (mə-lat′ō, myoo-lat′ō), *n.* کەسێکی دووڕەگ لە دایك و باوکێکی ڕەش و سپی.
***adj.*** سەوز؛ ڕەشتاڵە
**mulberry** (mul′ber′i, mul′bẽr-i), *n.* (١) توو؛ تووە سپیکە. (٢) دارتوو (٣) ئەرخەوانی؛ ڕەنگی ئەرخەوانی سوورکار.
**mulch** (mulch), *n.* گژوگیای ووشك و گەڵا و توێکڵەداری خڕکراوە لە بنی ڕووەکدا بۆ هێشتنەوەی تەڕایی بنی ڕووەکەکەو پاراستنی ڕەگەکانی لە سەرما و گەرما
***v.t.*** گژوگیای ووشك و گەڵا و توێکڵەدار خستنە بنی ڕووەك.
**mulct** (mulkt), *v.t.* (١) سزادان بە پارە لێ سەندن (لەبەر تاوان). (٢) بە فێڵ وتەڵەکە لێ سەندن؛ بە ساختە لێ کێشانەوە.
***n.*** سزای پارە (لەبەر تاوانێك).
**mule** (mūl), *n.* (١) هێستر؛ قاتر (٢) ڕێسەری لۆکە؛ مەکینەی ڕستنی لۆکە. (٣) [Colloq.]، کەسێکی کەللەڕەق؛ کەسێکی سەرسەخت و مانگر. (٤) توخمە گیاندارێکی دووڕەگی بێ بەر.
**mule** (mūl), *n.* سۆڵێکە پاژنەی پێ داناپۆشێ
**mule deer,** فیلەگێژە.
**mule skinner,** [Colloq.], قاترچی؛ هێسترچی.
**muleteer** (mū′lə-têr′), *n.* قاترچی؛ هێسترچی.
**muley** (mū′li, mool′i, mōō′li), ***adj. & n.*** = **mulley.**
**muliebrity** (mū′li-eb′rə-ti), *n.* (١) ژنێتی؛ ژنانەیی. (٢) مێچکەیی؛ ناسکی؛ ژنانەیی.
**mulish** (mūl′ish), *adj.* (١) هێستری. (٢) کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ مانگر. (٣) (ا) بێ بەر؛ نەزۆك. (ب) دووڕەگ.
**mull** (mul), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.], ( ~ over ), بیرلێکردنەوە: ***( to ~ over a question)***
**mull** (mul), ***v.t.*** خۆشاوکردن؛ گەرمکردنەوەو خۆشاوکردن (شەراب، بیرە، ئاوی سێو).
**mull** (mul), *n.* مەلمەل؛ قوماشی ئاوریشم یا چیتی تەنك.
**mullah, mulla** (mul′ə, mool′ɔ), *n.* مەلا؛ مامۆستای ئاینی.
**muller** (mul′ẽr), *n.* دەسکەوان (بۆ هاڕینی دەرمان و بۆیە).
**mullet** (mul′it), *n.* چەند جۆرە ماسییەکی دەریا و ڕووبارەکانە.
**mulley, muley** (mool′i, mōō′li), *adj.* شاخ کراو (ڕەشەووڵاخ)؛ بێ شاخ.
***n.*** مانگای بێ شاخ؛ مانگای شاخ کراو.
**mulligan** (mul′i-g'n), *n.* [Slang], شلەی گۆشت و سەوزە (بەتایبەتی هی پیاوی هەژاری بێ لانە).
**mullion** (mul′yən), *n.* تیغەدار یا شیشی ستوونی خانەخانەکەری شووشەی پەنجەرە.
**multi-** (mul′ti, mul′tə), پێشگرێکە بەمانای: فرە؛ زۆر؛ چەندەها؛ هەمە؛ گەلێك؛ چەند: ***( multicolored, multimillionaire)***
**multicolored** (mul′ti-kul′ẽrd), *adj.* هەمەڕەنگ؛ فرە ڕەنگ.
**multi-ethnic** (mul′ti-eth′nik), *adj.* فرە نەتەوە؛ فرە ڕەگەز: ***( a ~ city)***
**multifarious** (mul′tə-fâr′i-əs), *adj.* هەمەچەشن؛ فرە جۆر؛ جۆراوجۆر؛ جیاجیا؛ جۆرەها
**multifid** (mul′tə-fid), *adj.* بەش بەش (گەڵا)؛ خانە خانە؛ پارچە پارچە.
**multifold** (mul′tə-fōld′), *adj.* توێ توێ
**multiform** (mul′tə-fôrm′), *adj.* فرە شێوە؛ هەمەچەشن؛ جۆرەها.
**multilateral** (mul′ti-lat′ẽr-əl), *adj.* (١) فرە لایەن؛ فرە ڕوو؛ فرە لا. (٢) چەند لایی؛ فرە لایی؛ چەندەها وڵات یا لایەن تێیدا بەشدارە: ***( a ~ treaty)***
**-multilaterally** ***(adv.).***
**multimillionaire** (mul′ti-mil′yən-âr′), *n.* خاوەنی چەندەها ملیۆن دۆلار یا پاوەند؛ فرە ملیۆندار.
**multipara** (mul-tip′ə-rə), *n.* ئافرەتێکە کە سکی پڕە بە منداڵی دووەم یا بەلای کەمەوە دوو منداڵی لەوەوپێش بووە.
**multiparous** (mul-tip′ə-rəs), *adj.* (١) سکپڕ بە دووەم منداڵ. (٢) لە یەك بەچکە زیاتری دەبێ لە سکێکدا.
**multipartite** (mul′ti-pär′tīt), *adj.* (١) بەش بەش؛ جۆرەها؛ فرە بەش؛ پارچە پارچە. (٢) **multilateral** .
**multiped** (mul′ti-ped′), *adj.* *Also* **multipede,** فرە پێ.
***n.*** گیاندارێکی فرە پێ؛ گیاندارێکە لە چوار پێ زیاتری هەیە.
**multiple** (mul′tə-p'l), *adj.* چەندجار؛ جۆراوجۆر؛ زۆر؛ فرە.
***n.*** ئەنجامی لێکدان (ژمارەوپێوان): ***( 10 is a ~ of 5 and 2 .)*** .
**multiple-choice** (mul′tə-p'l-chois′), *adj.* فرە وەڵام؛ چەند وەڵامێك دەدات بۆئەوەی یەك وەڵامی ڕاستیان هەڵبژێرێت: ***( a ~ test, question, etc.)***
**multiple sclerosis,** نەخۆشی ڕەق بوون و ووشکبوونەوەی هەستە دەمارەکان کە دەبێتە هۆی لەکارکەوتن و لەرزینی ماسولکەکان.

**multipliable** (mul′tə-plī′ə-b'l), *adj.* دەتوانرێ لەیەك بدرێ (ژمارەوپێوان).
**multiplicable** (mul′tə-pli-kə-b'l), *adj.* = **multipliable.**
**multiplicand** (mul′tə-pli-kand′), *n.* ژمارەی لێدراو
**multiplicate** (mul′tə-pli-kāt′), *adj.* (١) توێ توێ. (٢) چەندەها؛ زۆر.
**multiplication** (mul′tə-pli-kā′shən), *n.* لێكدان (ژمارەو پێوان).
**multiplication table,** خشتەی لێكدان (ژمارەوپێوان).
**multiplicity** (mul′tə-plis′ə-ti), *n.* (١) زۆری؛ چەندەها؛ زۆری و جۆراوجۆری. (٢) ژمارەیەكی زۆر؛ گەلێك.
**multiplier** (mul′tə-plī′ēr), *n.* (١) زیادكەر (مرۆڤ، شت)؛ زاورێكەر. (٢) ژمارەی پێ لێدراو (ژمارەوپێوان) (٣) ئامێری بەهێزكەر (فیزیا).
**multiply** (mul′tə-plī′), *v.t.* (١) زیادكردن؛ زۆركردن؛ پەرەپێدان. (٢) لێكدان (ژمارەوپێوان).
*v.i.* (١) زاوزێ كردن؛ پەرەسەندن؛ زۆربوون: ***( Rabbits ~ rapidly.)*** . (٢) لێكدان (ژمارەیەك لە ژمارەیەكی تر).
**multitude** (mul′tə-tōōd′, mul′tə-tūd′), *n.* (١) زۆری؛ فرەیی؛ ژمارە زۆری. (٢) ژمارەیەكی زۆر؛ گەلێك؛ كۆمەڵ؛ هەزاران ***( There was a ~ of volunteers.)*** (٣) (**the ~**)، جەماوەر؛ خەڵك؛ بۆرە پیاوان.
**multitudinous** (mul′tə-tū′d'n-əs), *adj.* (١) بێ شومار؛ زۆر؛ نێجگار زۆر (٢) زۆرو جۆراوجۆر؛ هەمەچەشن.
**multivalent** (mul′ti-vā′lənt, mul-tiv′ə-lənt), *adj.* (١) فرە هاوهێزی (كیمیا). (٢) فرە مانا؛ فرە نرخ.
**multure** (mul′chēr), *n.* مزی ئاش؛ ئاشانە.
**mum** (mum), *n.* بیرەیەكی خەست و تیژە.
**mum** (mum), *v.i.* خۆگۆڕین بۆ خۆنواندن.
**mum** (mum), *n.* [Colloq.], = **chrysanthemum.**
**mum** (mum), *n.* [Colloq.], = **mother.**
**mum** (mum), *adj.* بێ دەنگ؛ نەدوو؛ قسەنەكەر؛ دەم داخراو
*interj.* بێ دەنگ بە!؛ قسە مەكە!؛ دەمت داخە!
**mumble** (mum′b'l), *v.t. & v.i.* (١) منجەمنج كردن؛ لەژێر لێوەوە وتن: ***( Don't ~ your words.; The old man was ~ing to himself.)*** (٢) بە یووك حووین بەهێواشی و نارەحەتی (لەبەر بێ ددانی).
*n.* منجەمنج
**mumbo jumbo** (mum′bō jum′bō), (١) [M- J-] ، بتێكی ئاشرینە خێلە رەشەكانی رۆژاوای سوودان دەیان پەرست؛ جادووگەرێكی ئایدیە كە بە ناو گوایە خەڵك لە وەی دەپارێزێ. (٢) شتێكی ترسناك. (٣) نەریتی ئاینی هیچ وپووچ و بێ مانا؛ نەریتی وەك جادووگەری (٤) قسەی هیچ وپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ مانا.
**mummer** (mum′ēr), *n.* (١) ئەكتەری خۆگۆڕی شانۆیی بێ دەنگ (٢) ئەكتەر.
**mummery** (mum′ēr-i), *n.* (١) نواندنێكە بە جلی خۆگۆڕینەوە. (٢) نواندنێكی كەش وفشانە؛ نەریت یا ئاهەنگێكی پڕ لە كەش وفش و هیچ وپووچ و دووڕووانە.
**mummification** (mum′ə-fi-kā′shən), *n.* موومیاكردن؛ موومیاكاری.
**mummify** (mum′ə-fī′), *v.t.* موومیاكردن؛ دەرهێنانی ئاوسكی مرۆڤ یا گیانداری مردوو و دەرمان تێكردنی بۆ پاراستنی لە بۆگەنكردن.
*v.i.* وشكبوونەوە؛ هەڵقرچان؛ سیس بوونەوە.
**mummy** (mum′i), *n.* (١) موومیا؛ مردووی موومیاكراو (٢) كەسێكی هەڵقرچاو؛ كەسێكی رەقەڵەو سیس بووەوە.

**mump** (mump), *v.t. & v.i.* (١) [Dial.] = **mumble.** (٢) [Old Slang]، (ا) سواڵكردن؛ پاڕانەوە. (ب) گزی كردن.
**mumps** (mumps), *n.pl.* ملەخڕێ؛ ئاوسانی لووی لیكی ژێر گوێچكە.
**munch** (munch), *v.t. & v.i.* كرماندن؛ ملچاندن؛ ملچەملچ كردن.
**mundane** (mun′dān), *adj.* (١) جیهانی؛ تایبەتی بەم جیهانە نەك بە جیهانێكی بەرزترو گیانی: ***( ~ pleasures)*** . (٢) ئاسایی؛ وشك و ناخۆش (مەجان)؛ سادە: ***( a ~ job, task, etc.)*** .
**mung bean,** ماش.
**municipal** (mū-nis′ə-p'l), *adj.* (١) (ا) شارەوانی؛ هی شارەوانی؛ هی ناوشار. (ب) سەربەخۆیی ناوخۆی هەیە. (٢) تایبەتی بە كاروباری ناوخۆی وولات یا هەرێمێك.
**municipality** (mū-nis′ə-pal′ə-ti), *n.* (١) شار؛ شارەوانی؛ شارێك كە سەربەخۆیی ناوخۆی هەبێ. (٢) كاربەدەستانی شار؛ كاربەدەستانی شارەوانی.
**municipalize** (mū-nis′ə-p'l-īz′), *v.t.* (١) خستنەسەر شار؛ كردن بە بەشێك لە شار؛ دانەدەم شار. (٢) كردن بە شار؛ كردن بە شارێك كە سەربەخۆی ناوخۆی هەبێ.
-**municipalization** *(n.).*
**munificence** (mū-nif′ə-s'ns), *n.* بەخشندەیی؛ زۆر دڵفراوانی؛ زۆر دەست ودڵ كراوەیی.
**munificent** (mū-nif′ə-s'nt), *adj.* (١) بەخشندە؛ زۆر دڵفراوان؛ زۆر دەست ودڵ كراوە. (٢) زۆر دڵفراوانی دەنوێنێ؛ نیشانەی بەخشندەیی و دەست ودڵ كراوەیی یە: ***( a ~ gift)*** .
**muniment** (mū′ni-mənt), *n.* (١) هۆی خۆپاراستن؛ هۆی پاراستن. (٢) (*pl.*)، باوەڕنامەی خاوەنێتی زەوی وزارو شتی تر؛ باوەڕنامەی ماف.
**munition** (mū-nish′ən), *v.t.* كەرەسەی جەنگ پێدان؛ چەكداركردن؛ چەك پێدان.
**munitions** (mū-nish′ənz), *n.pl.* جبەخانە؛ چەك و كەرەسەی جەنگ (گوللە، بۆمبا ... هتد).
**mural** (myoor′əl), *adj.* (١) هی سەر دیوار؛ هی دیوار؛ بۆ سەر دیوار. (٢) وەك دیوار؛ دیواری.
*n.* نیگار یا دیمەنی لەسەر دیوار كراو.
**muralist** (myoor′əl-ist), *n.* نیگاركێشی سەر دیوار.
**murder** (mūr′dēr), *n.* پیاوكوشتن بە دەسەنقەست؛ پیاوكوژی؛ خوێن ڕشتن؛ خوێن ڕێژی.
*v.t.* (١) پیاوكوشتن بە دەسەنقەست؛ كوشتن؛ خوێن ڕشتن. (٢) كوشتن بە شێوەیەكی دڕندانە و بێ بەزەیی یانە (جەنگ). (٣) تێكدان؛ شێواندن: ***( She ~ed that song.)*** .
*v.i.* پیاوكوشتن بە دەسەنقەست؛ خوێن ڕشتن.
**get away with murder,** [Slang], كارێكی خراپ كردن و كەس پێ نەزانین و سزا نەدران؛ بەدكاری كردن و وەك بەرزەكی بانان بۆی دەرچوون
**murder will out,** (١) پیاوكوژ هەر دەردەكەوێ؛ پیاوكوژی هەر دەردەكەوێ. (٢) كاری نهێنی و بەدكاری هەر دەردەكەوێ زوو یا درەنگ
**murderer** (mūr′dēr-ēr), *n.* پیاوكوژ؛ خوێن ڕێژ.
**murderess** (mūr′dēr-is), *n.* ئافرەتی پیاوكوژ؛ پیاوكوژی ژن.
**murderous** (mūr′dēr-əs), *adj.* (١) دڕندە؛ كوشندە؛ پیاوكوژانە؛ زۆر بەد؛ زۆر دڵڕەقانە: ***( a ~ act)*** . (٢) تایبەتی بە پیاوكوشتن؛ هی پیاوكوژی: ***( a ~ rage)*** . (٣) [Colloq.]، زۆر گران؛ زۆر ناخۆش و ترسناك: ***( a ~ exam)*** .
**murine** (myoor′īn, myoor′in), *adj.* هی توخمی مشك؛ هی گیانداری كرۆژەندە (وەك مشك و مشكەكوێرە ... هتد).
*n.* گیانداری كرۆژەندە.
**murk** (mūrk), *n.* تاریكی؛ لێڵی؛ نادیاری.
*adj.* [Archaic], تاریك؛ لێڵ؛ ناڕوون.
**murky** (mūr′ki), *adj.* (١) تاریك. (٢) لێڵ (ئاو، ئاسمان)؛ لیخن؛

*( ~ waters, air, etc.)* تەمومژاوی

(٣) لیل (مێشك): شێواو؛ تێکچوو.

(٤) نادیار؛ لێل. تێگەیشتنی گرانە.

-**murkily** *(adv.)*; **murkiness** *(n.)*.

**murmur** (mũr′mẽr), *n.* (١) خورە؛ خورەخور؛ خورەی ئاو.

(٢) بۆڵە؛ بۆڵەبوڵ لەژێر لێوەوە؛ خوتەوبۆڵە.

(٣) پرتەپرتی دڵ (پزیشکەوانی).

*v.i.* (١) خورەهاتن: خورەخورهاتن.

(٢) خوتەو بۆڵەهاتن؛ بۆڵەهاتن لەژێر لێوەوە

*v.t.* لەژێر لێوەوە وتن: لەبەر خووە وتن.

**murmurous** (mũr′mẽr-əs), *adj.* (١) خورەخورکەر

(٢) منجەمنجاوی؛ خوتەوبۆڵە لێوە هاتوو.

**murphy** (mũr′fi), *n.* [Slang]. = **potato.**

**murrain** (mũr′in), *n.* (١) دەردی ڕەشەوولاخ.

(٢) [Archaic]، تاعوون

**muscadine** (mus′kə-din, mus′kə-dīn′), *n.* (١) جۆرە ترێیەکە

(٢) [Obs.]. جۆرێکە لە شەراب.

**muscat** (mus′kət, mus′kat), *n.* (١) جۆرە ترێیەکی شەرابە

(٢) شەرابی ئەم ترێیە

**muscatel** (mus′kə-tel′), *n.* (١) جۆرە شەرابێکی شیرینە.

(٢) جۆرە ترێیەکی شیرینە ئەم شەرابەی لێ دروست دەکرێ.

**muscle** (mus′'l), *n.* (١) ماسولکە؛ ماژوولە؛ بازوو.

(٢) هێزی ماسولکە (٣) هێز؛ زەبر؛ زەبروزەنگ:

*( to put some ~ into law enforcement)*

*v.i.* [Colloq.], ( ~ **in** ), بەزۆر خۆ پیاکردن: بەزۆر ڕێی خۆ کردنەوە

**muscle sugar,** شەکری خاو: شەکری پاك نەکراوە

**Muscovite** (mus′kə-vīt′), *n.* دانیشتووی شاری مۆسکۆ؛

ڕووسی؛ هاونیشتمانیەکی ڕووسی

*adj.* ڕووسی؛ تایبەتی بە ڕووسیا.

**muscovite** (mus′kə-vīt′), *n.* کانزایەکی فافۆنی یا شووشەیی

کارەبا نەگەیەنەرە

**muscular** (mus′kyoo-lẽr), *adj.* (١) ماسولکەیی؛ بازۆڵەیی.

(٢) ماسولکەدار؛ بازوودار؛ بەهێز؛ بازۆڵەدار.

**muscular dystrophy,** ئێسکەنەرمە

**muscularity** (mus′kyoo-lar′ə-ti), *n.* ماسولکەداری بەهێزی؛

بازۆڵەداری

**musculature** (mus′kyoo-lə-chẽr), *n.* باری ڕێکخرانی ماسولکە

یا ئەندامێکی لەش

**musculo-** (mus′kyoo-lō, mus′kyoo-lə), *Also* **muscal-,**

پێشگرێکە بەمانای ماسولکە؛ بازوو.

**Muse** (mūz), *n.* (١) بانوخوای وێژەو هۆنراوەو هونەرو زانیاری

(ئەفسانەی یۆنانی) (٢) [m-]، پەری هۆنراوەو هونەر؛ پەری شیعر.

**muse** (mūz), *v.i.* ( ~ **over**; ~ **on** ), بیرکردنەوە؛ دانقەلێدان

*v.t.* (١) بیرلێکردنەوە. (٢) تێدا ڕامان؛ سەیرلێهاتن.

*n.* بیرکردنەوە

**museful** (mūz′fəl), *adj.* بیرکەرەوە؛ دانقەلێدەر.

**musette** (mū-zet′), *n.* (١) جۆرێکە لە زوڕنا یا جووزەلە.

(٢) ئاواز (٣) توورەکەی سەرشانی سەرباز.

**museum** (mū-zē′əm), *n.* مۆزەخانە: ئەنتیکەخانە.

**mush** (mush), *n.* (١) شۆربای گەنمەشامی.

(٢) شتێکی نەرموشلی تەڕوبڕی خەستوخۆل.

(٣) [Colloq.]، سۆزداری لە ڕادە بەدەر؛ هەست ناسکی (بەتایبەت دڵداری).

**mush** (mush), *v.i.* کاروانکردن بەناو بەفردا بە گالیسکە بەفرینەی سەگ.

*n.* کاروانێکی وەها.

*interj.* تێخوڕینی سەگی گالیسکەی بەفرین.

**mushroom** (mush′rōōm, mush′room), *n.* قارچك.

*adj.* (١) قارچکی؛ بە قارچك کراو.

(٢) لە قارچك دەچێ (لە شێوە یا زوو پەرەسەندندا).

*v.i.* (١) زوو پەرەسەندن؛ زوو گەورەبوون:

*( The demonstration ~ed into a riot.; Their business ~ed in the first year.)*

(٢) ئاوسان و سەر پان بوونەوە وەك قارچك؛ وەك قارچك لێهاتن.

**mushy** (mush′i), *adj.* (١) بڵ؛ نەرمو فشەڵ: *( ~ rice)* .

(٢) [Colloq.]، لە ڕادە بەدەر بەسۆز؛ زۆر بەسۆزو هەست ناسك.

**music** (mū′zik), *n.* (١) ساز؛ مۆسیقا.

(٢) ئاوازێکی خۆش (وەك خوێندنی باڵندەو خورەخوڕی ئاو).

**face the music,** [Colloq.], ڕووبەڕووی ئەنجامی ناخۆشی کاری خۆ

وەستان و قبووڵ کردنی.

**set to music,** ئاواز بۆ دانان؛ مۆسیقا بۆ دانان.

**musical** (mū′zi-k'l), *adj.* (١) سازی؛ مۆسیقایی.

(٢) خۆش ئاواز؛ دەنگخۆش.

(٣) مۆسیقازان؛ حەزکەر لە مۆسیقا؛ لێهاتووی مۆسیقا: *( a ~ person)* .

(٤) بە مۆسیقاوە؛ بە ئاوازەوە. *( a ~ comedy)* .

*n.* (١) **musical comedy** . (٢) ئاهەنگ بە مۆسیقاوە.

**musical comedy,** شانۆنامەی مۆسیقایی؛ فیلمی مۆسیقایی؛

فیلمی بە گۆرانی و مۆسیقاوە.

**musicale** (mū′zi-kal′), *n.* [Fr.], ئاهەنگێك بە مۆسیقاوە.

**music box,** سندووقی مۆسیقا.

**music hall,** شانۆی مۆسیقاو شانۆگەری؛ هۆڵی مۆسیقاو شانۆگەری.

**musician** (mū-zish′ən), *n.* مۆسیقاژەن بە پیشە؛ سازلێدەر.

**musicologist** (mū′zi-kol′ə-jist), *n.* مۆسیقاناس.

**musicology** (mū′zi-kol′ə-ji), *n.* زانستی مۆسیقا؛ مۆسیقاناسی.

**musing** (mūz′iŋ), *adj.* بیرکەرەوە.

*n.* بیرکردنەوە.

**musk** (musk), *n.* (١) مسك: ماددەیەکی بۆندارە لە توورەکەیەکی ژێر

چەرمی سکی ئاسکی مسك دەردەهێنرێ. (٢) مسك: بۆنێکی خۆشە بۆ لەخۆدان.

(٣) ئاسکی مسك.

**musk deer,** ئاسکی مسك.

**musket** (mus′kit), *n.* مەسکەت: جۆرە تفەنگێکی سەربازی پیادەی

کۆنە.

**musketeer** (mus′kə-têr′), *n.* سەربازی مەسکەت لەشان؛

مەسکەت لەشان.

**musketry** (mus′kit-ri), *n.* (١) هونەری تەقاندنی تفەنگی مەسکەت

(٢) (ا) تفەنگی مەسکەت بە کۆمەڵ. (ب) مەسکەت لەشانان.

**muskmelon** (musk′mel′ən), *n.* (١) شەمامە؛ کاڵەکەزەردە.

(٢) ڕووەکی شەمامە

**muskrat** (musk′rat′), *n.* (١) مشکی ئاوی: گیاندارێکی کرۆژەندەی

ئاوی کەوڵ ساف و بریقەدارە لە مشك دەچێ. (٢) کەوڵی ئەم گیاندارە.

**musk rose,** گوڵە مسك: گوڵێکی بۆنخۆشی سپییە.

**muslin** (muz′lin), *n.* مۆزلین: قوماشێکی لۆکەی تەنکە.

**musquash** (mus′kwäsh), *n.* = **muskrat.**

**muss** (mus), *n.* [Colloq. or Dial.], (١) پشێوی؛ ئاژاوە.

(٢) شەڕ؛ دەمەقاڵێ.

*v.t.* [Colloq. or Dial.], ( ~ **up** ), تێکدان؛ شێواندن.

**mussel** (mus′'l), *n.* جۆرێکە لە گوێچکەماسی

**mussy** (mus′i), *adj.* [Colloq.], ناڕێكوپێك؛ تێکەڵاوپێکەڵاو؛

بەسەریەکدا شێواو.

**must** (must), *v.aux.* (١) پێویستە؛ دەبێ؛ پێویست کردن:

*( I ~ pay you.)*

(٢) دەبێ؛ لەوە دەچێ: *( Then you ~ be her cousin.)* .

(٢) دەبێ: دەبێ وابووبێ. ***( It ~ have rained while we were in.)***

***n.*** شتێکی پێویست: شتێکە کە پێویستە بکرێ یا ببێ:
***| This book ( film, play ) is a ~. |***

***adj.*** پێویست: پێویستە

**must** (must), ***n.*** (١) مەستی (بەدبیەتی نێرەفیلی بەئالۆش).
(٢) نێرەفیلی بەئالۆش.

**must** (must), ***n.*** شەرابی تازە؛ خۆشاوی تازە

**must** (must), ***n.*** بۆگەن: بۆگەن کردن.

**mustache, moustache** (məs-tash′, mus′tash), ***n.*** سمێڵ

**mustang** (mus′taŋ), ***n.*** ئەسپەکێوی ڕۆژاوای ئەمەریکا

**mustard** (mus′tērd), ***n.*** (١) خەرتەلە
(٢) تووی هەڕاوی خەرتەلە کە دەگیرێتەوەو وەك بەهاراتو دەرمان بەکاردێت.
(٣) زەرد: ڕەنگی زەرد.

**mustard gas,** گازی خەرتەلە: گازێکی ژەهراوی کوشندەیە

**mustard oil,** ڕۆنی خەرتەلە (سابوونی لێ درووست دەکرێ)

**muster** (mus′tēr), *v.t.* (١) کۆکردنەوە (سەرباز)؛ کۆمەڵ کردن؛ بانگ کردن ***( The man was ~ed for roll call.)***
(٢) (~ up) کۆرج کردنەوە؛ کەوتنەخۆ؛ خستنەیەك (ئازایی، هێز)؛ کۆکردنەوە ***( M~ up your courage.)***

***v.i.*** کۆبوونەوە (سەرباز)؛ ڕیزبوون

***n.*** (١) کۆبوونەوە (سەرباز بۆ ناو خوێندنەوەو پشکنین).
(٢) کۆمەڵ: کەسانی کۆبوونەوەیەك؛ کۆبوونەوە.
(٣) لیستەی ناوی لقێکی سوپا یا هێزی دەریایی

**muster in,** گیران بە سەرباز

**muster out,** لە سەربازی خستن یا ئازادکردن

**pass muster,** باشە؛ پەسەندە؛ بەکاردەهێنرێ؛ پلەکەی پەسەندە

**mustiness** (mus′ti-nis), ***n.*** بۆن کەڕوو: بۆن دڕن

**musty** (mus′ti), ***adj.*** (١) بۆن کەڕووای: بۆن دڕناوی: بۆن کۆن.
(٢) کۆن: باوتەماو: سوواو

**mutability** (mū′tə-bil′ə-ti), ***n.*** بگۆڕی: هەمیشە گۆڕان: بێ باری.

**mutable** (mū′tə-b′l), ***adj.*** (١) بگۆڕ: دەگۆڕێ: دەتوانرێ بگۆڕدرێ.
(٢) بێ بار: حولحوڵ: هەمیشە گۆڕاو.

**mutate** (mū′tāt), ***v.i. & v.t.*** گۆڕان: گۆڕین: گۆڕانی بنچینەیی و کوتوپڕ (زیندەوەرزانی).

**mutation** (mū-tā′shən), ***n.*** (١) گۆڕان: گۆڕین
(٢) گۆڕانی شێوە، سرووشت، یا تایبەخۆیی.
(٣) (ا) گۆڕینێکی بنچینەیی کوتوپڕی گیاندارێك یا ڕووەکێكو بوون بەهۆی جیاوازییەکی زۆر نەچاو توخمو بنەچەکەیدا
(ب) گیاندار یا ڕووەکێکە کە ئەم گۆڕینەی بەسەردا بێت

**mutatis mutandis** (mū-tā′tis mū-tan′dis), [L.] دوای ئەوەی ئەو گۆڕینەی پێویست بوو بکرێ کرا

**mutative** (mū′tə-tiv), ***adj.*** دەگۆڕێ: گۆڕان بەشێکە لە سرووشتی

**mutchkin** (much′kin), ***n.*** [Scot.], پێوانەیەکی شلەیە هەشت یەکی گالۆنێکە

**mute** (mūt), ***adj.*** لاڵ؛ بێ زمان

***n.*** (١) لاڵ: کەڕولاڵ: کەسێکی کەڕولاڵ (٢) تیپی بێ دەنگ (زمانەوانی).
(٣) شتێکە بۆ کزکردنی دەنگی ئامێرێکی مۆسیقایی.

***v.t.*** (١) دەنگ کزکردن: نزم کردنەوە: خەفەکردن: کپ کردن.
(٢) لە توخی کەمکردنەوە (ڕەنگ)؛ لە توندوتیژی کەمکردنەوە (دەنگ).

**mutilate** (mū′t′l-āt′), *v.t.* (١) دەستوپەل برین؛ پەل برین: بەسەریەکدا شێواندن (لەش)؛ کەلەلاکردن: ***( His body was ~d.)***
(٢) شێواندن: تێکدان ***( The censors ~d his speech.)***

**-mutilation** ***(n.)***; **mutilative** ***(adj.)***; **mutilator** ***(n.)***.

**mutineer** (mū′t′n-ēr′), ***n.*** کەسێکی یاخی: سەربازی یاخی: یاخی: سەرپێچ

**mutinous** (mū′t′n-əs), ***adj.*** یاخیبوو؛ سەرپێچ.

**mutiny** (mū′t′n-i), ***n.*** یاخی بوون؛ سەرپێچی؛ یاخی بوونی سەرباز یا کەشتییەوان لە سەرۆکەکانیان.

*v.i.* یاخی بوون؛ سەرپێچی کردن

**mutt** (mut), ***n.*** [Slang], (١) گێژوویژ؛ کەسێکی بێ مێشك.
(٢) سەگی دووڕەگ.

**mutter** (mut′ēr), ***v.i.*** (١) منجەمنج کردن؛ لەژێر لێوەوە وتن.
(٢) بۆڵەبۆڵ کردن (بە دەنگی نزم)؛ خوتەوبۆڵەهاتن؛ سکاڵاکردن.
(٣) گرمەهاتن؛ گرمەگرم کردن.

*v.t.* بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵاکردن لەژێر لێوەوە؛ خوتەوبۆڵەهاتن.

***n.*** (١) منجەمنج کردن؛ بۆڵەبۆڵ کردن.
(٢) بۆڵەبۆڵ؛ وورتەوورت؛ منجەمنج؛ سکاڵا.

**mutton** (mut′′n), ***n.*** (١) گۆشتی مەڕ (٢) [Rare]، مەڕ.

**mutual** (mū′chōō-əl), ***adj.*** (١) (ا) دوولایی؛ دووسەرە؛ دووسەری: ***( ~ friendship, hate, suspicion, etc.)***
(ب) وەك یەك وان بۆ یەکتری: ***( ~ enemies)***.
(٢) ئاوکۆیی؛ هاو: ***( our ~ friend)***.
(٣) تایبەت بە کۆمپانیایەکی بیمە کە ئەندامەکانی بەشداری سوودو زیانی دەبن.

**mutualism** (mū′chōō-əl-iz′m), ***n.*** هاوکاری؛ ئالوگۆڕکردنی سوود؛ لەسەر یەکتری ژیانی دوو گیاندار.

**mutuality** (mū′chōō-al′ə-ti), ***n.*** دوولایەنی؛ دووسەری

**mutualize** (mū′chōō-əl-īz′), ***v.t. & v.i.*** (١) دوولایی کردن؛ کردن بە دووسەر؛ کردن بە هی هەردوولا. (٢) بەشداری کردنی کۆمپانیایەك؛ کردنی کۆمپانیایەك بە هی کرێکارەکانی.

**mutually** (mū′chōō-əl-i), ***adv.*** بۆ هەردوولا؛ دوولایەنە؛ دووسەری: ***( ~ beneficial)***

**muzzle** (muz′′l), ***n.*** (١) لمۆز؛ قەپۆز؛ دەموقەپۆز.
(٢) دەمبەست؛ دەمبێن؛ لەواشە.
(٣) سەر یا دەمی لوولەی چەکی ئاگرین.

*v.t.* (١) لەواشەکردن؛ دەمبێنەکردن؛ لمۆزکردن.
(٢) دەم داخستن؛ قسە لێ قەدەغەکردن.

**my** (mī), ***pron.*** هی من؛ هینی من؛ ~م (سەرم، پێڵاوەکانم).

***interj.*** پەحجا؛ پەکوو؛ بەهبەه؛ هاوار بە مالم: ***( Oh, ~ ! )***.

**my-** (mī), **myo-**.

**myalgia** (mī-al′ji-ə), ***n.*** ئازاری ماسولکە.

**myasthenia** (mī′as-thē′ni-ə), ***n.*** بێ هێزی ماسولکە؛ لاوازیو سستی ماسولکە.

**mycelium** (mī-sē′li-əm), ***n.*** بەشی سەوزەواتی قارچكو توخمەکەی کە لە شێوەی تاڵە دەڕووەدان.

**myco-** (mī′kō, mī′kə), پێشگرێکە بەمانای: قارچك؛ کەڕوو.

**mycobacterium** (mī′kō-bak-têr′i-əm), ***n.*** بەکتریای کەڕوو.

**mycology** (mī-kol′ə-ji), ***n.*** (١) قارچك زانی؛ کەڕووزانی؛ زانستی قارچكو کەڕوو. (٢) هەموو جۆرە قارچكو کەڕوویەکی ناوچەیەك

**mycosis** (mī-kō′sis), ***n.*** (١) پەیدابوونی کەڕوو لە لەشدا؛ کەڕووهەڵهێنانی لەش. (٢) نەخۆشی کەڕوو.

**mydriasis** (mi-drī′ə-sis, mī-drī′ə-sis), ***n.*** فراوانبوونی بیلبیلەی چاو (بەهۆی نەخۆشی یا دەرمانەوە).

**myelencephalon** (mī′ə-len-sef′ə-lon′), ***n.*** بەشی دواوەی مێشك.

**myelitis** (mī′ə-lī′tis), ***n.*** هەوکردنی مۆخی بڕبڕە؛ نەخۆشی مۆخ.

**myelo-** (mī′ə-lō), پێشگرێکە بەمانای: مۆخی بڕبڕەی پشت.

**myeloid** (mī′ə-loid′), ***adj.*** (١) هی مۆخی بڕبڕە.
(٢) تایبەتی بە مۆخ؛ لە مۆخ چوو یا وەرگیراو.

**myna, mynah** (mī′nə), ***n.*** باڵندەیەکی ئاسیاییە لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە.

**myo-** (mī′ō, mī′ə), پێشگرێکه بەمانای: ماسولکە.
**myocardiograph** (mī´ō-kär′di-ə-graf´, mī´ō-kär′di-ə-gräf´), *n.* ئامێری تۆمارکەری بزوانی ماسولکەی دڵ؛ وێنەگری بزوانی ماسولکەی دڵ.
**myocarditis** (mī´ō-kär-dī′tis), *n.* هەوکردنی ماسولکەی دڵ.
**myocardium** (mī´ō-kär′di-əm), *n.* ماسولکەی دڵ.
**myogenetic** (mī´ō-jə-net′ik), *adj.* لە ماسولکەوە پەیدادەبێ؛ لە ماسولکەوە هاتوو.
**myograph** (mī′ə-graf´, mī′ə-gräf´), *n.* ئامێری تۆمارکردنی کرژی ماسولکە.
**myology** (mī-ol′ə-ji), *n.* ماسولکەناسی (توێکاری)
**myoma** (mī-ō′mə), *n.* ئاوساوییەکی لە تێشووی شانە پێکهاتوو؛ لووی شانەی ماسولکە.
**myomatous** (mī-om′ə-təs), *adj.* تایبەتی بە ئاوساوی شانەی ماسولکە.
**myopathy** (mī-op′ə-thi), *n.* نەخۆشی ماسولکە.
**myope** (mī′ōp), *n.* نەخۆشی نزیک بین؛ نزیک بین.
**myopia** (mī-ō′pi-ə), *n.* نەخۆشی نزیک بینی؛ نزیک بینی.
**myopic** (mī-op′ik), *adj.* نزیک بین.
**myopy** (mī′ə-pi), *n.* = **myopia.**
**myosis** (mī-ō′sis), *n.* چوونەوەیەک یا کرژبوونی بیلبیلەی چاو (بەهۆی نەخۆشی یا بەکارهێنانی دەرمانەوە).
**myosotis** (mī´ə-sō′tis), *n.* ڕووەکێکە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێ.
**myotic** (mī-ot′ik), *adj.* هی بیلبیلەی چاو هێنانەوەیەکو کرژکردن؛ بیلبیلەی چاو کرژبوو؛ دەبێتە هۆی چوونەوەیەکی بیلبیلەی چاو.
*n.* دەرمانی بیلبیلەی چاو کرژکردن یا هێنانەوەیەک.
**myria-** (mir′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) بێ شومار؛ زۆر؛ گەلێک. (٢) دە هەزار
**myriad** (mir′i-əd), *n.* (١) دە هەزار
(٢) هەزاران: هەزارەها؛ ژمارەیەکی بێ شومار یا ئێجگار زۆر.
*adj.* بێ شومار؛ هەزارەها؛ ئێجگار زۆر
**myriapod** (mir′i-ə-pod´), *adj. & n.* هەزارپێ.
**myriapodan** (mir´i-ap′ə-dən), *adj. & n.* = myriapod.
**myriapodous** (mir´i-ap′ə-dəs), *adj.* = myriapod.
**myrmeco-** (mūr′mi-kō, mūr′mi-kə), پێشگرێکە بەمانای: مێروولە
**myrmecology** (mūr´mi-kol′ə-ji), *n.* مێروولەزانی: زانستی مێروولە
**myrmecophagous** (mūr´mi-kof′ə-gəs), *adj.* مێروولەخۆر
**myrrh** (mūr), *n.* (١) جەوی دار " موڕ ".
(٢) داری " موڕ " دارێکی بۆنخۆشە جەورییەک دەردەدات بۆنی خۆشی لێ درووست دەکرێ.
**myrtaceous** (mūr-tā′shəs), *adj.* مۆردی؛ هی درەختی مۆردو یوکالیپتۆس
**myrtle** (mūr′t'l), *n.* مۆرد.
**myself** (mī-self′, mə-self′), *pron.* (١) خۆم
*(I went ~ .; I hurt ~ .)*
(٢) دۆخی چاکی خۆم؛ دۆخی باشیم:
*(I am not ~ when I rage like that.)*
**mystagogue** (mis′tə-gôg´, mis′tə-gog´), *n.* لێکدەرەوەی شتی ئاینی لێڵو نهێنی؛ مامۆستای شتی نهێنیو نەزانراوی ئاینی.
**-mystagogy** *(n.).*
**mysterious** (mis-têr′i-əs), *adj.* نادیار؛ لێڵ: شاراوە.
**mystery** (mis′tēr-i, mis′tri), *n.* (١) شتی نەزانراو یا دەرنەکەوتوو؛ نهێنی *(the ~ of life)*.
(٢) (أ) ڕووداوێکی شاراوە (بەتایبەتی پیاوکوشتن).
(ب) چیرۆکی ڕووداوێکی شاراوەی وەها.
(٣) لێڵی؛ نهێنی؛ شاراوەیی: *(An air of ~ surrounds this affair.)*.
(٤) (*pl.*)، نەریتو بیروڕای ئاینی.
(٥) کۆمەڵی ئاینی نهێنی کۆن. (٦) **a mystery play**.
(٧) (أ) نوێژی بەکۆمەڵی کڵێسەی کاسۆلیکی.
(ب) ڕوودانی ژیاننامەی عیساو مەریەم.
**mystery** (mis′tēr-i), *n.* [Archaic], پیشە.
**mystery play,** شانۆنامەی ڕووداوێکی ئینجیل بەتایبەتی هی ژیاننامەی عیسا.
**mystic** (mis′tik), *adj.* (١) تایبەتی بە نەریتو بیروڕای ئاینی نهێنی.
(٢) نهێنی؛ شاراوە؛ نادیار: *(~ powers)*.
(٣) هی سۆفی یا سۆفیێتی.
*n.* سۆفی.
**mystical** (mis′ti-k'l), *adj.* (١) نیشانەیی؛ گرنگ لەڕووی ئاینییەوە.
(٢) هی سۆفی یا سۆفیێتی. (٣) [Rare]، شاراوە؛ لێڵ؛ نهێنی؛ نادیار
**mysticism** (mis′tə-siz'm), *n.* (١) سۆفیێتی.
(٢) بیروڕای شاراوە یا نادیار؛ بیرکردنەوە لە شتی نادیار.
**mystify** (mis′tə-fī´), *v.t.* (١) سەرسام کردن؛ سەرسوڕماندن.
(٢) شاردنەوە بۆ تێنەگەیشتنی؛ وەهالێکردن کە سەیر بێتە بەرچاوو تێگەیشتنی گران بێت.
**-mystification** *(n.).*
**mystique** (mis-tēk′), *n.* هەستی سەرسامیو شکۆ پێدانو دڵفڕاندن کە شتێک، کەسێک، یا پیشەیەک درووستی دەکات لەلای هەندێ کەس
*(the ~ of Eastern music, art, progress, revolution, the acting profession, etc.)*
**myth** (mith), *n.* (١) ئەفسانە. (٢) سەرجەمی ئەفسانەکان.
(٣) چیرۆکی ئەفسانەیی؛ چیرۆکی درۆ.
(٤) کەسێک یا شتێکی ئەفسانەیی.
**mythic** (mith′ik), *adj.* = **mythical.**
**mythical** (mith′i-k'l), *adj.* (١) ئەفسانەیی: *(a ~ creature)*.
(٢) درۆ؛ هەڵبەستراو؛ ڕێکخراو.
**mythicize** (mith′i-sīz´), *v.t.* کردن بە ئەفسانە؛ بە ئەفسانە دانان؛ وەک ئەفسانە لێکردن.
**mytho-** (mith′ō, mith′ə), پێشگرێکە بەمانای: ئەفسانە.
**mythological** (mith´ə-loj′i-k'l), *adj.* ئەفسانەیی.
**mythologist** (mi-thol′ə-jist), *n.* ئەفسانەزان؛ قوتابی ئەفسانە.
**mythologize** (mi-thol′ə-jīz´), *v.i.* ئەفسانە لێکدانەوە؛ دەربارەی ئەفسانە نووسین.
*v.t.* = **mysticize.**
**mythology** (mi-thol′ə-ji), *n.* (١) ئەفسانەزانی؛ زانستی ئەفسانە.
(٢) کتێبی ئەفسانە؛ پەرتووکێک دەربارەی ئەفسانە.
(٣) ئەفسانە؛ سەرجەمی ئەفسانەی چەرخێك یا نەتەوەیەک.
**mythomania** (mith´ə-mā′ni-ə), *n.* زۆر حەز لە درۆکردن؛ حەز لە شت گەورەکردن.
**mythopoeic, mythopeic** (mith´ə-pē′ik), *adj.* ئەفسانە درووستکەر؛ حەزکەر لە ئەفسانە درووستکردن.
**mythos** (mī′thəs), *n.* (١) (أ) **myth**. (ب) **mythology**.
(٢) نەریتو خووڕەووشتی نەتەوەیەکە وەک لە هونەری ئەو نەتەوەیەدا دەردەکەوێ. (٣) مرۆڤ پەرستی.
**myxedema, myxoedema** (mik´si-dē′mə), *n.* جۆرە نەخۆشییەکە لە ئەنجامی باش کارنەکردنی لووی " سایرۆد " هەوە تووش دەبێو نیشانەکانی ووشکبوونەوەی پێستو سستی لەشو مێشکە.
**myxo-** (mik′sō, mik′sə), پێشگرێکە بەمانای: چڵم؛ ماددەی لینج.
**myxoid** (mik′soid´), *adj.* چڵمین؛ لینج.

**myxoma** (mik′sō-mə), *n.* لووی بێ زیانی چڵمین.

**myxomycete** (mik′sō-mī-sēt′), *n.* کەڕووی چڵمین یا لینج.

# N n

**N, n** (en), *n.* (١) تیپی چواردەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " ئێن ". (٣) قاڵبی ئەم تیپە.
(٤) نیشانەی پلەی چواردەهەم؛ پلەی چواردەهەم.
*adj.* (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) چواردەهەم؛ پلەی چواردەهەم.
**N** (en), *n.* (١) شتێکە لە شێوەی تیپی " N " دا.
(٢) ژمارە (٩٠)ی ڕۆمانی.
**nab** (nab), *v.t.* [Colloq.], (١) پر پێداکردن؛ هەڵپڕوسکان؛ ڕفاندن.
(٢) گرتن (تاوانکار).
**nabob** (nā'bob), *n.* (١) فەرمانڕەوای خۆیی ناوچەیەکی ئیمپراتۆریەتی مەغۆل لە هیندستان؛ فەرمانڕەوای ناوچەیی هیندی.
(٢) ئەوروپاییەکی دەوڵەمەند لە هیندستاندا. (٣) کەسێکی زۆر دەوڵەمەند.
**nacelle** (nə-sel'), *n.* خانەی فڕۆکەوان، مەکینە، یا بار لە هەندێ فڕۆکەدا
**nacre** (nā'kĕr), *n.* = mother-of-pearl.
**nacreous** (nā'kri-əs), *adj.* (١) ماددەیەکی وەك مرواری بەرەکەیەوەیە (قاقلەی گیانداری ئاوی). (٢) بریقەدار.
**nadir** (nā'dĕr, nā'dêr), *n.* (١) نزمترین خاڵی جیهان (ئەستێرەناسی)
(٢) نزمترین پلە؛ نزمترین شوێن؛ بنی بن؛ پەستترین کات:
*( the ~ of human misery)*
**nag** (nag), *v.t.* سەرکونکردن (بە ڕەخنەو برتەوبۆڵە)؛ سەر خستنەسەر؛ هەمیشە بۆڵەبۆڵ کردن بەسەرداو ڕەخنەلێگرتن.
*v.i.* هەمیشە بۆڵەبۆڵ کردن و ڕەخنەگرتن.
*n.* (١) سەرکونکردن؛ هەمیشە بۆڵەبۆڵ کردن و ڕەخنەگرتن.
(٢) [Colloq.]. سەرکونکەر (بەتایبەتی ئافرەت و بەتایبەتیش بۆ مێردەکەی)؛ هەمیشە بۆڵەبۆڵکەرو سکاڵاکەر (ئافرەت)
**nag** (nag), *n.* (١) ئەسپی سواری بچووك؛ ئەسپ.
(٢) ئەسپی پیری لەکارکەوتوو؛ ئەسپی بێ فەڕ
**nagger** (nag'ĕr), *n.* کەسێکی سەرکونکەر (بەتایبەتی ئافرەت)؛ کەسێکی هەمیشە بۆڵەبۆڵکەرو ڕەخنەگر.
**naiad** (nā'ad, nī'ad), *n.* (١) حۆری ئاو: کچێکی ئەفسانەییە گوایە لە کانی و ڕوبارد دەژی و دەبێتە هۆی هەڵقووڵانیان و ووشك نەکردنیان.
(٢) ئاوڕۆشنکەرەوە. (٣) ئافرەتی مەلەوان.
**naif** (nä-ēf'), *adj.* = naive.
**nail** (nāl), *n.* (١) (أ) نینۆك (ب) چنگ؛ چڕنووك. (٢) بزمار.
(٣) پێوانەیەکی کۆنی کوتاڵە بریتییە لە دوو گرێ و چواریەکی گرێیەك.
(٤) [Slang]، جگەرە.
*v.t.* (١) بزمارلێدان؛ بە بزمار قایم کردن.
(٢) بەستنەوە (مەجاز)؛ مسۆگەرکردن؛ دڵنیابوون لە دەستکەوتنی شتێك
*( He ~ed the bargain, contract, etc.)*
(٣) چاو تێ بڕین؛ چاو لێ نەترووکاندن: *( eyes ~ed to the stage)*
(٤) [Colloq.]، گرتن؛ بەرەوبڕی دانەوەو گرتن: *( to ~ a criminal)*
(٥) [Colloq.]، هەڵمالین (درۆ)؛ خستنەڕوو؛ گرتن: *( to ~ a lie)*
(٦) پێکان و خستنەخوارەوە: *( to ~ a bird in flight)*
**fight tooth and nail,** بەوپەڕی تواناوە شەڕکردن یا هەوڵدان.
**hit the nail on the head,** پێکان؛ باش بۆ چوون؛ باش ووتن یا کردن.
**nail (a person) down (to a promise),** بەستنەوەی کەسێك بە بەڵێنەکەیەوەو واز لێ نەهێنانی هەتا بەڵێنەکەی جێبەجێ دەکات.
**nail up,** (١) بە بزمار داکوتان یا هەڵواسین.
(٢) داخستن بە بزمار (دەرگا، پەنجەرە)؛ بە بزمار قایم کردن:
*( to nail up a window)*
**on the nail,** (١) یەکسەر؛ دەمودەست؛ بەبێ دواکەوتن.
(٢) لە کات یا شوێنی خۆیدا.
**nail clipper,** نینۆککەر؛ مەکینەی نینۆك کردن.
**nail file,** بڕبەندی نینۆك.
**naive, naïve** (nä-ēv'), *adj.* ساویلکە؛ خۆش باوەڕ؛ نەزان؛ دڵ ساف.
-naively *(adv.)*; naiveness *(n.)*.
**naiveté, naïvete** (nä-ēv'tā', nä-ēv'tā), *n.* (١) ساویلکەیی؛ خۆش باوەڕی؛ نەزانی؛ دڵ سافی (٢) تێبینی یا کردارێکی ساویلکانە؛ گوفتار یا کاری دڵ سافانە.
**naivety** (nä-ev'ti), *n.* = naiveté.
**naked** (nā'kid), *adj.* (١) ڕووت؛ ڕووتوقووت: *( a ~ body)*.
(٢) هەژار؛ بێ دەرامەت؛ فەقیر. (٣) بەرەڵا؛ نەپارێزراو.
(٤) (أ) ڕووت؛ لەناو کێلانەکەیدا نییە: *( a ~ sword)*.
(ب) ڕووت (درەخت)
(ج) ڕووت (دیوار)؛ نەڕازاوە؛ هیچی پێوە نییە: *( a ~ wall)*.
(٥) ئاشکرا؛ ڕووت؛ هەڵماڵراو: *( the ~ truth; ~ aggression)*
(٦) بەتاڵ. *( a ~ contract)*
(٧) بێ تووك؛ بێ پەڕ؛ بێ قاووغ؛ بێ پوولەکە؛ ڕووت.
**naked eye,** چاوی ڕووت؛ چاوی بێ چاویلکە یا دووربین.
**nakedness** (nā'kid-nis), *n.* ڕووتی؛ ڕووتوقووتی؛ هەڵماڵراوی؛ ئاشکرایی.
**nameable** (nām'ə-b'l), *adj.* (١) ناو دەهێنرێ؛ دەتوانرێ ناوی بهێنرێ. (٢) شایانی ناوبردنە؛ بەناو؛ دیار
**namby-pamby** (nam'bi-pam'bi), *adj.* (١) ناسکۆڵە؛ ژنانە؛ هەست ناسك. (٢) بوودەڵە؛ بێ غیرەت؛ بێ دەسەڵات؛ چرووك؛ لاواز؛ ڕاڕ
*n.* (١) قسەو نووسراوی ژنانەو چرووکانە؛ نووسراوی بەسۆز
(٢) کەسێکی بێ غیرەت و بێ دەسەڵات؛ کەسێکی بوودەڵە (لەڕووی سووکی).
**name** (nām), *n.* (١) ناو.
(٢) قسەی خراپ؛ ناووناتۆرە. *( They called him ~s.)*.
(٣) (أ) ناو؛ ناوبانگ؛ ناوداری: *( a good ~ )*
(ب) ناوبانگی باش؛ ناوی باش. (٤) خێڵ: *( the last of my ~ )*
(٥) بەناو؛ هەر بەناو: *( He is chief in ~ only.)*.
(٦) کەسێکی ناودار؛ کەسێکی زۆر بەناوبانگ:
*( the greatest ~ in science)*
(٧) ناو (ڕێزبێژی).
*adj.* ناسراو؛ ناودار؛ بەناوبانگ.
*v.t.* (١) ناولێنان؛ ناونان.
(٢) ناوهێنان؛ ناوبردن؛ ناونووس کردن: *( He was ~ed in the report.)*.
(٣) بە ڕاستی ناو ووتن: *( He ~ed the States of the Union.)*
(٤) دانان لەسەر کاربەدەستییەکی گرنگ؛ دامەزراندن.

(٥) دیاری کردن (نرخ، کات)؛ دانان: ***( to ~ a price, date, day, etc.)*** .
**call a person names,** جوێن پێدان؛ جنێو پێدان؛
ناوی سووك پێ ووتن.
**in the name of,** (١) بەناوی: ***( in the name of the law)*** .
(٢) بەپێی دەسەلاتی؛ بەناوی.
**know only by name,** تەنها ناو زانین و هیچی تر؛ نەناسین.
**to one's name,** هەبوون؛ خاوەنی بوون:
***( He only has ten dollars to his name.)***
**nameable** (nām′ə-b'l), ***adj.*** – **namable.**
**name-dropper** (nām′drop ́ēr), ***n.*** کەسێکە کە زوو زوو ناوی
کەسانی بەناوبانگ دەهێنێ لەبەرچاوی خەڵك کە گوایە دەیان ناسێ بۆ
خۆفشکردنەوەو خۆهەڵکێشان.
**nameless** (nām′lis), ***adj.*** (١) بێ ناو؛ ناو نەزانراو: ***( ~ stars)*** .
(٢) کەس نەزان؛ نەناسراو.
(٣) ناوی ناهێنرێ؛ ناتوانرێ باسی بکرێ: ***( ~ dread)*** .
(٤) شاراوە؛ لێڵ؛ نادیار.
(٥) شایانی ناوبردن نی‌یە؛ ئەوەندە خراپە ناتوانرێ ناوی ببرێ: ***( ~ voices)*** .
**namely** (nām′li), ***adv.*** واتە
**namesake** (nām′sāk ́), ***n.*** هاوناو: کەسێکە کە بە ناوی کەسێکی
ترەوە ناوی نرابێ
**nanny** (nan′i), ***n.*** [British], لەلەی مند ڵ؛ دایەن.
**nanny goat,** [Colloq.], بزن
**nap** (nap), ***v.i.*** سەرخەوشکاندن؛ قنگەخەوکردن؛
کەروێشکەخەوکردن.
***n.*** سەرخەو؛ کەروێشکەخەو؛ قنگەخەو:
***( to take a ~ ; I take a ~ every afternoon.)***
**nap** (nap), ***n.*** (١) تیسك قوماش و تەنراوی تازە)
(٢) ئەو تیسکەی لە تەنراوی تازە دەبێتەوە بە یەکەم فلچە لێدان.
(٣) گەندەموو (ڕووەکناسی).
***v.t.*** (١) تیسك بژکردنەوە بە فلچە
(٢) تیسکی درێژو زیادە برین؛ ساف کردن؛ سفت کردن.
**napalm** (nā′päm), ***n.*** ناپالم؛ بۆمبای ناپالم.
**nape** (nāp, nap), ***n.*** بۆقەنەی مل؛ پشت مل؛ ئەستۆ
**napery** (nā′pēr-i), ***n.*** سەرمێزو دەستەسڕو شتی تری وەهای ناومال.
**naphthalene** (naf′thə-lēn ́, nap′thə-lēn ́), ***n.*** نەفتالین
**napkin** (nap′kin), ***n.*** (١) دەستەسڕی کاغەز؛ دەستەسڕی سەر مێزی
نانخواردن. (٢) [Chiefly British]، دەرپێی منداڵ.
**napoleon** (nə-pō′li-ən, nə-pōl′yən), ***n.*** (١) پارەیەکی زێڕی
فەرەنسایی کۆنە. (٢) جۆرە یاری‌یەکی کاغەزە.
(٣) جۆرە شیرینی‌یەکی فەرەنسی‌یە.
**Napoleonic** (nə-pō ́li-on′ik), ***adj.*** ناپلیۆنی: تایبەتی بە ناپلیۆنی
یەکەم و هێرشە جەنگی‌یەکانی و چەرخەکەی.
**nappy** (nap′i), ***adj.*** تووکن؛ تووکاوی؛ گەندەمووواوی
**nappy** (nap′i), ***adj.*** (١) بەتین (بیرە). (٢) نەختێ سەرخۆش.
***n.*** [Scot.], بیرە؛ خواردنەوەیەکە لە بیرە دەکات.
**narcism** (när′siz'm), ***n.*** – **narcissism.**
**narcissism** (när-sis′iz'm), ***n.*** (١) خۆپەرستی؛ من منۆکی.
(٢) دل چوونە خۆ؛ حەز لە خۆ کردن؛ خۆ خۆشویستن.
**narcissist** (när-sis′ist), ***n.*** (١) خۆپەرست
(٢) حەز لە خۆ کەر؛ دڵ بە خۆوە بوو.
**-narcissistic** ***(adj.).***
**narcissus** (när-sis′əs), ***n.*** (١) [N-] . لاوێکی جوان بوو ئەوەندە
حەزی لە وێنەی خۆی دەکرد لە ئاودا هەتا پووکایەوەو بوو بە نێرگز.
(٢) نێرگز
**narco-** (när′kə, när-kō′), پێشگرێکە بەمانای: (١) سڕی؛ سستی؛
خاوی. (٢) دەرمانی سڕکەر.
**narcolepsy** (när′kə-lep ́si), ***n.*** نەخۆشی زۆر نوستن.
**narcosis** (när-kō′sis), ***n.*** سڕبوون یا گێژبوون بە تلیاك کێشان و
شتی تری وەها.
**narcotic** (när-kot′ik), ***adj.*** (١) سڕکەر؛ گێژکەر.
(٢) تایبەتی بە شتی گێژکەر یا سڕکەر وەك بەنگ و تلیاك و... هتد.
(٣) تایبەتی بە تلیاك؛ تایبەتی بەو کەسانەی خوویان بە تلیاك کێشان و شتی
تری وەهاوە گرتووە
***n.*** (١) دەرمانی گێژکەر (وەك تلیاك و بەنگ و... هتد)؛ شتی سڕکەر. (٢) تلیاك.
(٣) شتی خەولێخەر یا شتی سستکەر.
**narcotism** (när′kə-tiz'm), ***n.*** (١) گێژبوون یا سڕبوون بە تلیاك
کێشان و شتی تری وەها (٢) خووگرتن بە تلیاك کێشان و شتی تری گێژکەر
یا سڕکەرەوە.
**nares** (nâr′ēz), ***n.pl.*** کونە لووتەکان؛ کونە لووت.
**narghile** (när′gə-li, när′gə-lā ́), ***n. Also*** **nargile, nargileh**
نێرگەلە.
**narial** (nâr′i-əl), ***adj. Also*** **naric, narine,** هی کونە لووتەکان؛
کونە لووتی.
**nark** (närk), ***n.*** [British Slang], سووسە؛ سیخوڕ؛ جاسووس.
***v.i.*** سیخوڕی کردن؛ سووسەکردن.
**narrate** (na-rāt′, nar′āt), ***v.t. & v.i.*** گێڕانەوە (چیرۆك)؛ هۆنینەوە.
**narration** (na-rā′shən), ***n.*** (١) گێڕانەوە (چیرۆك)؛ هۆنینەوە؛
دووان. (٢) چیرۆك. (٣) چیرۆکی نووسراو؛ نووسراوی گێڕراوە (وەك مێژوو،
ژیاننامەو... هتد).
**narrative** (nar′ə-tiv), ***adj.*** (١) چیرۆکی؛ لەشێوەی چیرۆکدایە؛
هۆنراوەیی. (٢) لەشێوەی چیرۆکدا دەنووسێت.
***n.*** (١) چیرۆك. (٢) چیرۆك گێڕانەوە؛ هونەری چیرۆك گێڕانەوە.
**narrator, narrater** (na-rā′tēr), ***n.*** چیرۆکبێژ؛ چیرۆك گێڕەرەوە؛
گێڕەرەوە.
**narrow** (nar′ō), ***adj.*** (١) تەسك؛ تەنگ؛ تەنگەبەر؛ باریك.
(٢) کەم: ***( a ~ majority)*** .
(٣) تەسك (مێشك): ***( a ~ mind, outlook)*** .
(٤) وورد: ***( a ~ inspection)*** .
(٥) بە ئاستەم؛ بە حاڵ: ***( a ~ escape)*** .
(٦) بێ دەرامەت؛ کەم دەرامەت؛ دەستکورت: ***( ~ circumstances)***
***v.i.*** تەسکبوونەوە: ***( The river ~s.)*** .
***v.t.*** تەسك کردنەوە؛ سنوور بۆ دانان؛ کەمکردنەوە (مەودا):
***( He ~ed the argument.)***
***n.*** (١) ڕێگەی تەسك؛ ڕێڕەوی تەسك. (٢) گەروو (ئاوەڕێ)؛ تەنگاو.
**-narrowness** ***(n.).***
**narrowly** (nar′ō-li), ***adv.*** (١) بە ئاستەم؛ بە حاڵ:
***( He ~ escaped drowning, getting caught, etc.)***
(٢) بە ووردی.
**narrow-minded** (nar′ō-mīn ́did), ***adj.*** مێشك تەسك؛
بیر تەسك.
**-narrow-mindedly** ***(adv.)***; **narrow-mindedness** ***(n.).***
**narthex** (när′theks), ***n.*** (١) هەیوانی قەراغ کڵێسە (لە کۆندا ئافرەت و
خەڵکی تاوانکاری پەشیمان بووەوە بەکاریان دەهێنا). (٢) ڕاڕەوەی کڵێسە.
**narwhal** (när′wəl, när′hwəl), ***n. Also*** **narwhale,** کەرکەدەنی
دەریا: جۆرە نەهەنگێکی تەوەری باکوورە کەڵبەیەکی درێژی هەیە لە شاخ
دەچێت.
**nasal** (nā′z'l), ***adj.*** (١) لووت؛ تایبەتی بە لووت.
(٢) بە لووت بێژراو (وەك تیپی: م، ن، نگ).
(٣) منگن؛ تایبەتی بە دەنگی لووتی: ***( a ~ voice)*** .
***n.*** (١) دەنگی منگن؛ تیپی منگن یا بە لووت ووتراو. (٢) ئێسقانی لووت.

(٢) لووت بۆش (كلاوزری).

**nasalize** (nā′z'l-īz′), *v.i. & v.t.* بە لووت قسەكردن؛ بە لووت روتن؛ منگنی كردن.

**-nasalization** *(n.)*.

**nascency** (nas′'n-si, nā′s'n-si), *n.* لەدایكبوون؛ پەیدابوون؛ هاتنە جیهانەوە.

**nascent** (nas′'nt, nā′s'nt), *adj.* ساوا (كلتور، بیروڕا)؛ تازە؛ تازە پەیدابوو؛ تازە لەدایكبوو.

**nastiness** (nas′ti-nis), *n.* (١) بەدی؛ ناپەسەندی؛ پیسی؛ بەدخوایی؛ بەدسرووشتی. (٢) كارێك یا گوفتارێكی ناپەسەندو پیس.

**nasturtium** (nə-stûr′shəm), *n.* (١) ڕووەكێكە گەلای قەلغانیو گوڵی ڕەنگاوڕەنگی وەك ڕەحەتی دەگرێت. (٢) گوڵی ئەم ڕووەكە.

**nasty** (nas′ti), *adj.* (١) پیس؛ چەپەڵ؛ پیس‌وپۆخڵ.

(٢) ناخۆش (چێژ)؛ پیس: *( a ~ taste)* .

(٣) ناشرین (كردار، ڕەووشت)؛ بۆگەن؛ پیس؛ نزم.

(٤) ناخۆش (ناووهەوا)؛ پیس؛ خراپ: *( ~ weather)* .

(٥) توورەوترۆ؛ بەدخواز؛ ناپەسەند؛ كینەدار؛ بەدسرووشت؛ خراپ:

*( a ~ temper, person, remark, etc.)*

(٦) زیانبەخش؛ خراپ؛ ترسناك: *( a ~ bruise, wound, etc.)* .

**-nastily** *(adv.)*.

**natal** (nā′t'l), *adj.* (١) هی لەدایكبوون: *( ~ injuries)* .

(٢) هی كات یا شوێنی لەدایكبوون.

**natality** (nā-tal′ə-ti), *n.* (١) [Rare] ، لەدایكبوون

(٢) birth rate

**natant** (nā′t'nt), *adj.* سەرئاوكەوتوو؛ سەرئاو:

*( the ~ leaves of water lilies)*

**natation** (nā-tā′shən), *n.* مەلەكردن؛ مەلە؛ هونەری مەلەكردن

**natatorial** (nā′tə-tôr′i-əl, nā′tə-tō′ri-əl), *adj.* = **natatory.**

**natatorium** (nā′tə-tôr′i-əm, nā′ə-tō′ri-əm), *n.* گۆمی مەلە (بەتایبەتی هی ژوورەوە یا ناو خانوو).

**natatory** (nā′tə-tôr′i, nā′tə-tō′ri), *adj.* هی مەلە؛ سەرئاوكەوتوو؛ مەلەكەری (باڵندە)

**nates** (nā′tēz), *n.pl.* كوورپی سمت؛ كوورپی قنگ؛ كەفەل.

**natheless** (nāth′lis, nath′lis), *adv. Also* **nathless**, [Arch.], = **nevertheless.**

**nation** (nā′shən), *n.* (١) نەتەوە؛ گەل؛ میللەت. (٢) وولات.

(٣) (ا) خێڵ. (ب) خێڵێكی هیندی ئەمەریكی.

(ج) خاكی خێڵێكی وەها.

**national** (nash′ən-'l), *adj.* (١) نەتەوەیی؛ نیشتمانی؛ میللی؛ نەتەوایەتی. (٢) نیشتمانپەروەر؛ وولات پەروەر.

*n.* (١) هاوولاتی؛ هاونیشتمانی: *( a U.S. ~ )* .

(٢) هاوولات؛ هاونیشتمان.

**national anthem,** سروودی نیشتمانی؛ سروودی میللی.

**national bank,** بانقی میللی

**national Guard,** پاسەوانی نیشتمانی؛ پاسەوانی میللی.

**national income,** داهاتی ساڵێكی وولات؛ دەسكەوتی میللی.

**nationalism** (nash′ən-'l-iz'm), *n.* (١) نەتەوەپەرستی؛ نەتەوەگەری؛ نەتەوەگەرێتی؛ نەتەوەچێتی؛ ڕەگەزپەرستی.

(٢) نیشتمانپەروەری؛ نیشتمانپەروەرێتی.

(٣) سەربەخۆیی خوازی.

**nationalist** (nash′ən-'l-ist), *n.* (١) نەتەوەپەرست؛ نەتەوەچی؛ ڕەگەزپەرست؛ نەتەوەپەروەر. (٢) نیشتمانپەروەر.

*adj.* هی نەتەوەپەرستی؛ هی نیشتمانپەروەری.

**nationalistic** (nash′ən-'l-is′tik), *adj.* نەتەوەپەرست؛ هی نەتەوەپەرستی؛ هی نەتەوەچێتی: *( ~ feelings)* .

**nationality** (nash′ə-nal′ə-ti), *n.* (١) زندنامە؛ زێنامە؛ ڕەگەزنامە.

(٢) نەتەوە؛ گەل؛ ڕەگەز: *( There are many ~ies in America.)*

(٣) سەربەخۆیی نیشتمانی؛ سەربەخۆیی نەتەوەیی.

(٤) تایبەخۆو ڕووخسارو ڕەووشتی نەتەوەیەك.

**nationalization** (nash′ən-'l-i-zā′shən), *n.* خۆماڵی كردن؛ كردن بە ماڵی میللەت.

**nationalize** (nash′ən-'l-īz′), *v.t.* (١) هەموو وولات پێ گرتنەوە؛ گشتی كردن؛ بلاوكردنەوە بە هەموو وولاتدا. (٢) كردن بە ماڵی میللەت؛ خۆماڵی كردن؛ خۆماڵی كردنی هۆی بەرهەم هێنان وەك: كارگەو كۆمپانیاو پیشەسازی ... هتد: *( to ~ the oil companies)* .

(٣) كردن بە وولاتێكی سەربەخۆ؛ سەربەخۆیی پێدان.

**nationally** (nash′ən-'l-i), *adv.* (١) لە هەموو وولاتەكەدا؛ لەمسەری وولاتەوە بۆ ئەوسەری. (٢) وەك نەتەوەیەك؛ وەك گەلێك

**national park,** باخی گەل؛ باخی میللی: سەیرانگایەكی جوانو دڵگیرە میری سەرپەرشتی دەكات بۆ ڕابواردنو بەكارهێنانی گەل.

**nationhood** (nā′shən-hood′), *n.* سەربەخۆیی نەتەوەیی؛ بوون بە نەتەوە یا وولاتێكی سەربەخۆ.

**nationwide** (nā′shən-wīd′), *adj.* سەرانسەری وولات؛ گشتی؛ هی هەموو وولات: *( a ~ strike)* .

**native** (nā′tiv), *adj.* (١) زگماكی: *( a ~ ability)* .

(٢) خۆماڵی؛ خۆیی؛ خۆولاتی؛ ناوخۆیی؛ بنەچەیی؛ خۆكەری:

*( ~ industry; ~ plants; a ~ New Yorker).*

(٣) (ا) هی خۆ؛ خۆیی: *( one's ~ land)* .

(ب) دایكی؛ زگماكی: *( one's ~ language)* .

(٤) سرووشتی؛ خواكرد؛ دەست تێوە نەدراو.

(٥) تایبەتی بە دانیشتوانی ناوچەیەك (بەتایبەتی گەلی سەرەتایی)؛ خۆیی:

*( ~ customs)*

*n.* (١) خۆماڵی؛ شتێكی خۆماڵی؛ شتێكی خۆیی.

(٢) (ا) خەڵكی شوێنێك بە بنەچە؛ كەسێكی خۆولاتی:

*( a ~ of Sulaimani)*

(ب) گیاندار یا ڕووەكی خۆماڵی؛ گیاندار یا ڕووەكی خۆولاتی یا هی ناوچەكە خۆی. (٣) كەسێكی نیشتەنی؛ نیشتەجێ.

**native-born** (nā′tiv-bôrn′), *adj.* خەڵكی فلان شوێنە؛ لە فلان شار یا وولات لەدایكبووە

**nativism** (nā′tiv-iz'm), *n.* (١) پێشخستنی سوودی خەڵكی وولاتەكە خۆی بەسەر هی كۆچكەراندا. (٢) فەلسەفەی بیری خۆیی: دەڵێت كە گوایە مێشك خۆی لە خۆیدا بیروڕای لێوە پەیدادەبێت بەبێ ئەوەی لە دەرەوەی خۆی وەری بگرێ. (٣) بووژاندنەوەی نەریتو خووی خۆولاتی.

**nativity** (nə-tiv′ə-ti, nā-tiv′ə-ti), *n.* (١) لەدایكبوون.

(٢) بارودۆخی لەدایكبوون. (٣) چارەنووس دۆزینەوە بەگوێرەی كەلووەكان

**the Nativity,** (١) لەدایكبوونی عیسا. (٢) نوواندنی ئەم لەدایكبوونە.

(٣) ڕۆژی كریسمەس.

**natural** (nach′ēr-əl), *adj.* (١) سرووشتی؛ بەگوێرەی سرووشت.

(٢) سرووشتكرد؛ خواكرد؛ خواكردە.

(٣) تایبەتی بە سرووشت؛ سرووشتی: *( a ~ science)* .

(٤) (ا) خاو؛ نەپاڵێوراو (ب) نەزان؛ كێوی؛ كاڵ‌وكرچ؛ تێنەگەیشتوو.

(٥) هی جیهانی سرووشتی نەك گیانی.

(٦) زگماكی؛ لەخۆوە: *( ~ abilities)* .

(٧) سرووشتی؛ بە زگماكی: *( ~ rights)* .

(٨) ڕاستەقینە؛ سرووشتی.

(٩) ئاسایی؛ سرووشتی؛ سەیر نییە؛ جێی سەرسوڕمان نییە:

*( a ~ outcome)*

(١٠) ئاسایی؛ لە جێی خۆیایەتی: *( a ~ courtesy)* .

(١١) خاكی؛ سادە؛ بەبێ كەش‌وفش.

(١٢) ژن ( a ~ child).

**n.** (١) کەسێکی بێ مێشك؛ کەر؛ گەوجەن.

(٢) [Colloq.] کەسێکی کارامەو لێهاتوو بە زگماکی

(٣) [Colloq.] شتێکە بۆی هەیە کە زۆر سەرکەوتوو بێت.

**natural gas,** گازی سرووشتی

**natural history,** (١) مێژووی سرووشتی (گیانەوەرناسی، رووەکناسی، کانزاناسی، زەمینناسی). (٢) لێکۆڵینەوەی گیاندارو رووەك بەشێوەیەکی نازانیاریانە.

**naturalism** (nach′ēr-əl-iz′m), **n.** (١) هەست و کردەوەو بیری سرووشتی. (٢) (ئ) خۆ بەستنەوە بە شێوازی راستەقینەوە لە نواندنی دیاردەی ژیاندا بەبێ گۆڕین و رازاندنەوەی بەتایبەتی لە ویژەو هونەری نیگارکێشاندا. (ب) نەنجامی ئەم شێوازە. (٣) فەلسەفەیەکە دەڵێت: کە سرووشت هەمووشتێکە لە جیهانداو هیچ شتێك نییە لە سرووشت بەدەر؛ سرووشتخوازی؛ سرووشت خوایی.

**naturalist** (nach′ēr-əl-ist), **n.** (١) سرووشتناس؛ زانای سرووشت؛ زانای گیاندارو رووەك. (٢) سرووشتخواز لە ویژەو هونەردا (ووشەی پێشوو ببینە).

**naturalistic** (nach′ēr-ə-lis′tik), **adj.** (١) هی مێژووی سرووشتی و زانایانی مێژووی سرووشت. (٢) تایبەتی بە سرووشتخوازی لە ویژەو هونەردا (ووشەی پێشوو ببینە). (٣) بەپێی سرووشت؛ سرووشتی.

**naturalize** (nach′ēr-ə-līz′), **v.t.** (١) زندنامە دان بە بێگانەیەك؛ کردن بە هاوولاتی؛ مافی هاوولاتێتی پێدان ( to ~ an alien).
(٢) وەرگرتن و وەك هی خۆ واڵێکردن (ووشە، خوو، نەریت)
(٣) راهێنان بە دەوروبەری تازە (گیاندار، رووەك). (٤) سرووشتخوازی کردن.
(٥) خاکی کردن؛ وەك سادە لێکردن.

**v.i.** (١) راهاتن بە دەوروبەری تازە. (٢) لە سرووشت کۆڵینەوە.

-naturalization *(n.).*

**natural law,** یاسای سرووشتی (دەربارەی رەووشت)

**naturally** (nach′ēr-əl-i), **adv.** (١) بە خاکیانە؛ بە سادەیی؛ بەبێ کەشوفش ( to speak and behave ~).
(٢) بە زگماکی ( She is ~ musical.)
(٣) بێ گومان ( I was ~ surprised.).
(٤) لەخۆوە؛ سرووشتکرد

**natural philosophy,** (١) سرووشتناسی؛ زانستی سرووشت (٢) فیزیا.

**natural resources,** سامانی سرووشتی (هی ژێرزەمین و سەرزەمین)

**natural science,** زانستی سرووشت (وەك گیانەوەرناسی، رووەکناسی، زەمینناسی، کیمیا، فیزیا)

**natural selection,** هەڵبژاردنی سرووشتی، مانەوەو زاڵبوونی بەهێزترین ئەندامانی توخمی گیاندارو رووەك لە جیهاندا بەهۆی توانای راهاتنیانەوە لەگەڵ پێویستی ژیان و دەوروبەرو سرووشتدا.

**nature** (nā′chēr), **n.** (١) ماك؛ کروك؛ گەوهەر؛ نەژاد
(٢) خوو و سرووشتی زگماکی ( Cruelty was against his ~.).
(٣) جۆر؛ جەشن ( things of that ~ )
(٤) هەست و نەست و حەزو ناحەزی کەسێك. (٥) سرووشت؛ جیهان.
(٦) [N-] هێزی سرووشت.
(٧) کێوێتی؛ دۆخ یا چەرخی سەرەتایی مرۆڤ.
(٨) دیمەنی سرووشت ( to enjoy ~ )

**by nature,** بە زگماکی؛ هەر لەخۆوە

**in a state of nature,** (١) رووت و قووت؛ رووت
(٢) کێوی؛ دەستی نەکراو؛ چۆن خوا دروستی کردووە وەها.
(٣) کێوی؛ مرۆڤ، کۆمەڵگا

**-natured** (nā′chērd), پاشگرێکە بەمانای خوو و سرووشتێکی تایبەتیدار ( good-natured)

**nature study,** لێکۆڵینەوەی گیاندارو رووەك بە زانیاریانە

**nature worship,** (١) سرووشت پەرستی. (٢) جوانی سرووشت پەرستی

**naturopathy** (nā′chēr-op′ə-thi), **n.** چارەکردنی سرووشتی؛ چارەکردنی نەخۆشی لەرێگەی هۆی سرووشتییەوە وەك: تیشکی خۆرو هەوای پاك و خواردەمەنی و شێلان لەباتی دەرمان.

**naught, nought** (nôt), **n.** (١) هیچ؛ هیچ شتێك. (٢) سفر.
*adj.* [Archaic or Obs.], (١) بێ نرخ؛ بێ بایەخ؛ هیچ و پووچ. (٢) بەدخوا؛ خراپ؛ بەد؛ ناپەسەند.
*adv.* [Obs.], هیچ؛ بە هیچ جۆرێك.

**naughtiness** (nô′ti-nis), **n.** لاساری؛ هاروهاجی؛ بەدخوویی؛ چەقاوەسوورێتی؛ بێ حەیایی.

**naughty** (nô′ti), **adj.** (١) لاسار؛ بەدخوو؛ بێ حەیا؛ چەقاوەسوور؛ هاروهاج ( a ~ boy).
(٢) بێ شەرم (لەرووی گاڵتەوە)؛ هەڵمەتراو ( a ~ wink).
(٣) [Obs.]، بەدخوا؛ بەد؛ ناپەسەند.

-naughtily *(adv.).*

**naumachia** (nô-mā′ki-ə), **n.** (١) جەنگی دەریایی درۆ یا هەر بەناو. (٢) جێی جەنگێکی وەها.

**nausea** (nô′shə, nô′shi-ə, nô′zhə, nô′si-ə), **n.** (١) هێڵنج؛ هێڵنج دان؛ دڵ تێکەڵهاتن؛ دڵ تێکچوون. (٢) قێز؛ قێزوبێز؛ رق؛ قین.

**nauseate** (nô′shi-āt′, nô′zhi-āt′), **v.t.** (١) قێز لێ هاتنەوە؛ هێڵنج پێدان؛ زۆر پەستکردن؛ دڵ تێکەڵهێنان ( You ~ me.).
(٢) [Rare]، رق لێ بوونەوە.

**v.i.** دڵ تێکەڵهاتن؛ دڵ تێکچوون؛ هێڵنج دان.

**nauseous** (nô′shəs, nô′zhəs, nô′siəs), **adj.** (١) هێڵنج پێدەر؛ دڵ تێکەڵهێنەر. (٢) پیس؛ بۆگەن.

**nautical** (nô′ti-k′l), **adj.** دەریایی؛ تایبەتی بە دەریاوانان و کەشتی و دەریاوانی.

**nautical mile,** میلی دەریایی: کە بریتییە لە ١٨٥٢م، یا ٦٠٧٦ پێ.

**nautilus** (nô′t′l-əs), **n.** گیاندارێکی دەریایی بچووکی قاقڵەی پێچ پێچۆکەدارە.

**naval** (nā′v′l), **adj.** (١) [Obs.]، تایبەتی بە کەشتی و کەشتییەوانی. (٢) تایبەتی بە هێزی دەریایی.

**nave** (nāv), **n.** ناوجەرگەی کڵێسە؛ ساڵۆنی دانیشتنی کڵێسە؛ هۆڵی کڵێسە.

**nave** (nāv), **n.** تەوەری پێچکە یا رەورەوە

**navel** (nā′v′l), **n.** (١) ناوك (لەش). (٢) شتێك کە لە ناوك بچێ.

**navel orange,** جۆرە پرتەقاڵێکی بێ دەنکە سەرێکی لە ناوك دەچێ.

**navicular** (nə-vik′yoo-lēr), **adj.** لە بەلەم دەچێ (ئێسقان)؛ بەلەمی.
*n.* ئێسقانی بەلەمی بەتایبەتی هی مەچەك و خرتکەی پێ.

**navigable** (nav′i-gə-b′l), **adj.** (١) کەشتی پێدا دەروات (ئەوەندە پان و قووڵە) ( a ~ river).
(٢) لێ دەخورێت؛ دەڕانرێ ( a ~ baloon).

-navigability *(n.).*

**navigate** (nav′ə-gāt′), **v.i.** (١) بە کەشتی یا بەلەم چوون؛ یا کەشتکردن. (٢) کەشتی یا فڕۆکە راندن؛ کەشتی یا فڕۆکە لێخورین.
*v.t.* (١) کەشتی یا فڕۆکە راندن؛ کەشتی یا فڕۆکە لێخورین.
(٢) پێدا پۆیشتن؛ رێگەیەکی تایبەتی گرتن یا برین ( to ~ a stream).

**navigation** (nav′ə-gā′shən), **n.** (١) کەشتی راندن؛ کەشتی یا فڕۆکەراندن. (٢) دەریارانی (بەتایبەتی بۆ مەبەستی بازرگانی).

**navigator** (nav′ə-gā′tēr), **n.** (١) کەشتیران؛ فڕۆکەوان؛ لێخور– (کەشتی و فڕۆکە). (٢) گەرۆکی دەریا بۆ شوێنی تازە دۆزینەوە.

**navvy** (nav′i), **n.** [British], کرێکاری ناکارامە

**navy** (nā′vi), **n.** (١) [Archaic or Poetic]، گەلەکەشتی.
(٢) سەرجەمی کەشتی جەنگی ووڵاتێك. (٣) [N-]، هێزی دەریایی.

navy blue (٤)

**navy blue,** شینی تۆخ؛ شینی دەریایی.

**navy yard,** کارگەی دروستکردن و چاك کردنەوەی کەشتی هێزی دەریایی

**nay** (nā), *adv.* (١) [Archaic] نەء؛ نەخێر.

(٢) نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هی تریش؛ نەك... بەڵکو:

*(I will permit, ~ , encourage it.)*

*n.* (١) نەء؛ نەخێر؛ نەء کاری.

(٢) دەنگی نەنی (دەنگدان)؛ دەنگی دژ؛ دەنگدەری نەنی.

(٣) وەڵامی نەنی.

**Nazarene** (naz′ə-rēn′ naz′ə-rēn′), *n.* (١) کەسێکی خەڵکی " ناسیر " ە لە فەلەستین بەتایبەتی عیسا. (٢) ئەندامی کۆمەڵێکی کۆنی خاچ پەرستی جوولەکە. (٣) [Obs.]، خاچ پەرست؛ عیسایی.

**Nazi** (nä′tsi, na′tsi, na′zi), *adj.* نازی؛ فاشستی.

*n.* کەسێکی نازی؛ ئەندامی حیزبی نازی ئەڵمانی کە بە سەرۆکایەتی هیتلەر ئەڵمانیای خستە ژێر دەستی خۆی.

**Naziism, Nazism** (nä′tsi-iz'm, na′zi-iz'm), *n.* نازیتی: فەلسەفەی نازیتی؛ فەلسەفەی حیزبی نازی ئەڵمانی؛ فاشیزمی ئەڵمانی.

**N.B., n.b.,** تێبینی؛ باش سەرنجی لێ بدە. (کورتەی " nota bene ").

**Neanderthal** (ni-an′dēr-täl′), *adj. & n.* نیاندرتاڵ ئادەمیزادی هەرە کۆن

**neap tide,** بەرزاوی زۆر کەم یا نزم.

**Neapolitan** (nē′ə-pol′ə-t'n), *adj.* ناپۆلی؛ تایبەتی بە شاری " ناپۆلی نیتالی

*n.* دانیشتووی شاری " ناپۆلی "

**near** (nêr), *adv.* (١) نزیك (شوێن، کات):

*(Summer is drawing ~ .)*

(٢) نزیکەی؛ ئەوەندەی نەماوە

(٣) زۆر لە نزیکەوە

(٤) بە پیسکەیی؛ بە پوولەکێتی.

*adj.* (١) نزیك (شوێن، کات). (٢) نزیك (خزم، خزمایەتی).

(٣) نزیك (رادەری، هەست)؛ گیانی بە گیانی.

(٤) بە ئاستەم؛ بە حاڵ: *(a ~ escape)*.

(٥) لای چەپ؛ لە لای چەپ: *(the ~ horse)*.

(٦) نزیك (رێگە)؛ راستەوخۆ؛ قەدبڕ

(٧) پیسکە؛ پوولەکی؛ ڕەزیل.

(٨) نزیکە لێوەی؛ لێی دەچێ؛ وەك ئەو وایە: *(~ beer)*.

*prep.* نزیك (شوێن، کات، پلە)؛ کەم.

*v.t. & v.i.* نزیك کردنەوە؛ نزیکبوونەوە.

**near at hand,** زۆر نزیك (کات، شوێن، ڕووداو)؛ زۆری نەماوە:

*(Victory is near at hand.)*

**nearby** (nêr′bī′), *adj. & adv.* نزیك (شوێن، کات).

**Near East,** ڕۆژهەڵاتی نزیك؛ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**nearly** (nêr′li), *adv.* (١) خەریکە؛ زۆری نەماوە؛ ئەوەندەی نەمابوو:

*(I'm ~ finished.; He ~ died.)*

(٢) زۆر نزیك (خزمایەتی، لێکچوون): *(They are ~ related.)*.

(٣) بە پیسکەیی؛ بە پوولەکییانە؛ بە ڕەزیلی.

(٤) نزیکەی.

**near miss,** نەپێکان بەڵام زیان پێ گەیاندن (بۆمباباران)؛ نەگرتن؛ نەپێکان

**near-sighted** (nêr′sīt′id), *adj.* نزیکبین؛ دوورنەبین.

**-neasightedness** *(n.)*.

**neat** (nēt), *adj.* (١) تێکەڵ نەکراو (خواردنەوەی کحوولی)؛ یەکسەر.

(٢) سافی (سوود، مووچە، دەسکەوت): *(~ profit)*.

(٣) خاوێن؛ پاك و تەمیز؛ ڕێك و پێك: *(a ~ room)*.

(٤) ڕێك و پێك؛ ورد و لێهاتوو؛ پوخت: *(a ~ worker)*.

(٥) تەرپۆش؛ ڕێك و پێك: *(a ~ appearance)*.

(٦) جوان؛ دڵگیر: *(a ~ dress)*.

(٧) لێهاتوو؛ باش؛ کارامە

**-neatly** *(adv.)*; **neatness** *(n.)*.

**neat** (nēt), *n.* [Obs.], ڕەشەووڵاخ.

**neath** (nēth, nē*th*), *prep.* [Poetic], = **beneath.**

**neatherd** (nēt′hūrd′), *n.* گاوان.

**neb** (neb), *n.* (١) (ا) دەنووك. (ب) لمۆز؛ قەپۆز.

(٢) دەم و لووت؛ دەم؛ لووت؛ قەپۆز. (٣) نووك؛ سەر.

**nebula** (neb′yoo-lə), *n.* (١) پەڵکە هەور؛ تەنکە هەور؛ کۆمەڵە ئەستێرەی زۆر دوورە کە وەك تەپ و تۆزی سپی یا تەنکە هەور دەردەکەوێ (٢) (ا) تانە؛ لیڵی کۆرنیای چاو. (ب) لیڵی میز. (ج) پرژە دەرمان.

**-nebular** *(adj.)*.

**nebulize** (neb′yoo-līz′), *v.t.* (١) شلەکردن بە پرژ؛ بە پرژکردن.

(٢) دەرمان هەڵپرژاندن لە برین.

**nebulosity** (neb′yoo-los′ə-ti), *n.* (١) لیڵێتی؛ تەم و مژی؛ نادیاری (٢) **nebula**.

**nebulous** (neb′yoo-ləs), *adj.* (١) تەنکەهەوری؛ لە تۆزی تەنك دەچێ بە بەرزایی ئاسمانەوە. (٢) لیڵ؛ تەم و مژاوی. (٣) نادیار؛ ناڕوون؛ لیڵ.

**necessarily** (nes′ə-ser′ə-li, nes′ə-sâr′ə-li), *adv.* بە ناچاری؛ بە پێویستی: *(That is not ~ so.)*.

**necessary** (nes′ə-ser′i), *adj.* (١) پێویست:

*(Water is ~ to life.)*

(٢) ناچارەکی؛ هەر دەبێ ببێ؛ خۆی لێ لانادرێ.

(٣) زۆرەملێ.

*n.* (١) (*pl.*)، ویستەمەنی. (٢) [Dial.]، ئاودەست.

**necessitate** (nə-ses′ə-tāt′), *v.t.* پێویست کردن:

*(The increse in population ~s a greater food supply.)*

**necessitous** (nə-ses′ə-təs), *adj.* هەژار؛ دەستکورت.

**necessity** (nə-ses′ə-ti), *n.* (١) چارەنووس. (٢) ناچاری.

(٣) پێویستی: *(Death is a ~ to life.)*

(٤) شتێکی پێویست: *(A passport is a ~ .)*.

(٥) پێویستییەکی زۆر؛ ناچاری: *(Call me in case of ~ .)*

(٦) (*pl.*)، ویستەمەنی. *(the ~ies of life)*.

(٧) پێویستێتی (٨) هەژاری؛ دەستکورتی.

**make a virtue of necessity,** کردنی شتێك لە ناچاریدا بەڵام وا پیشاندان کە بە خۆشی خۆ و لە باشی و پیاوەتی خۆوە کراوە.

**necessity knows no law,** لەکاتی پێویستیدا هەموو پەرژینێك دەشکێنرێ؛ پێویستی سنوور نازانێ.

**of necessity,** بە ناچاری؛ لە ناچاریدا؛ لە ئاوانا.

**neck** (nek), *n.* (١) مل؛ گەردن؛ ئەستۆ.

(٢) ملی شتێك: *(the ~ of a violin)*.

(٣) ملیوان. (٤) باریکترین یا تەسکترین بەشی شتێك کە لە مل دەچێ، بەتایبەتی: (ا) تیرە زەوی (ب) ملی ئامێر. (ج) ملی شووشە یا بوتڵ. (د) گەروو (ئاوەڕێ)؛ تەنگاو

*v.t.* (١) سەربڕین (باڵندە)؛ خنکاندن؛ مل شکاندن (مەل).

(٢) [Slang]، دەستبازی و ماچ کردن.

*v.i.* [Slang]. دەستبازی و ماچ کردن؛ باوەش پیاکردن و ماچ کردن

**break one's neck,** [Slang], ملی خۆ شکاندن (لە کردنی کارێکدا)؛ ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەلادان (بۆ جێبەجێکردنی شتێك)؛ خۆ کوشتن بۆ کردنی کارێك (مەجاز)

**get it in the neck,** سزای باش خواردن؛ بە توندی سەرزەنشت کران.

**neck and neck,** بەرامبەر؛ هاوجووت (پێشبڕکێی ئەسپ، هەڵبژاردن ... هتد. *( The two candidates were neck and neck.)*
**neck of the woods,** [Colloq.], ناوچە؛ کونج.
*( When will you visit our neck of the woods?)*
**risk one's neck,** ژیانی خۆ خستنە مەترسییەوە.
**save one's neck,** (١) خۆ لە هەڵواسین ڕزگارکردن. (٢) خۆ ڕزگارکردن؛ خۆ دەربازکردن؛ دەربازبوون
**win by a neck,** (١) بردنەوە بە درێژایی ملێك، واتە بە ئاستەم (پێشبڕکێی ئەسپ). (٢) بە ئاستەم بردنەوە (پێشبڕکێ، ملەملێ).
**neckerchief** (nek'ēr-chif), *n.* ملپێچ؛ سرکەیی
**necking** (nek'iŋ), *n.* (١) نەقشی ڕازاندنەوەی دەوری تەوقەسەری پایە (خانووسازی). (٢) [Slang]، دەستبازیو ماچ‌ومووچ کردن.
**necklace** (nek'lis), *n.* ملوانکە؛ گەردانە.
**necktie** (nek'tī'), *n.* بۆینباخ؛ قەرەواتە
**neckwear** (nek'wâr'), *n.* مل پۆش، وەك ملپێچ، سرکەیی، ملیوان، بۆینباخ
**necro-** (nek'rō, nek'rə), پێشگرێك بەمانای: مردن؛ لاشە؛ شانەی ڕزیو: *( necrology)*
**necrology** (ne-krol'ə-ji), *n.* (١) تۆمارنامە یا لیستەی ناوی مردووان (لە ڕۆژنامەدا). (٢) یادکردنەوەی مردوو لە ڕۆژنامەدا.
**necromancer** (nek'rə-man'sēr), *n.* (١) پێشبین لەڕێی گفتوگۆوە لەگەڵ مردووان. (٢) جادووگەر
**necromancy** (nek'rə-man'si), *n.* (١) پێشبینی لەڕێی گفتوگۆوە لەگەڵ مردووان. (٢) جادووگەری.
**necrophile, necrophil** (nek'rə-fil'), *n.* حەز لە مردووکەر.
**necrophilia** (nek'rə-fil'i-ə), *n. Also* **necrophilism.** حەز لە مردوو کردن
**necrophilism** (ne-krof'ə-liz'm), *n.* = **necrophilia.**
**necrophobia** (nek'rə-fō'bi-ə), *n.* ترسانێکی نائاسایی لە مردن و لاشەی مردوو
**necropolis** (ne-krop'ə-lis), *n.* گۆڕستانی شارێکی کۆن؛ شاری مردووان
**necropsy** (nek'rop-si), *n.* توێکاری لاشەی مردوو
**necrosis** (ne-krō'sis), *n.* (١) بووکانەوە یا ڕزینی شانەی ئەندامێکی لەش. (٢) بووکانەوەو فەوتانی ڕووەك و داروودرەخت.
**necrotomy** (ne-krot'ə-mi), *n.* (١) یەکلاکردنەوەی لاشەی مردوو (٢) لابردنی ئێسقانی بووکاوە بە توێکاری.
**nectar** (nek'tēr), *n.* (١) خواردنەوەی خودایی (ئەفسانەی یۆنانی) (٢) خواردنەوەیەکی زۆر خۆش (٣) شیلە - لیکی گوڵ (کە هەنگ هەنگوینی لێ درووست دەکات).
**-nectareous** *(adj.).*
**nectarine** (nek'tə-rēn', nek'tə-rēn'), *n.* نێکتەرین، میوەیەکی شیرینە لە قۆخ دەچێ پێستەکەی سافە
**nectary** (nek'tə-ri), *n.* ئەندامی شیلە دەرکەری گوڵ
**nee, née** (nā), *adj.* وەها لەدایکبوو، وشەیەکە بۆ دیاری کردنی نازناوی کچێنی ئافرەتێکی مێرددار، واتە هی پێش شووکردنی (لە کۆمەڵگای ڕۆژئاوادا ئافرەت کە شووی کرد نازناوی مێردەکەی وەردەگرێت):
*( Mrs. Helen Jones, ~ Smith.)*
**need** (nēd), *n.* (١) پێویستی
*( There is no ~ to worry now.)*
(٢) پێویست بوون؛ ویستن: *( I feel the ~ of a long rest.)*.
(٣) ویستەمەنی *( What are his daily ~s ?)*.
(٤) تەنگانە: *( A friend in ~ is a friend indeed.)*.
(٥) نەبوونی؛ هەژاری؛ دەستکورتی *( to be in ~ )*.
*v.t.* پێویستن؛ ویستن؛ گەرەك بوون.
*( I ~ more time to think about it.; He ~s to be careful.)*
*v.i.* (١) پێویست پێ بوون؛ ویستن. (٢) [Rare] پێویست کردن.
**if need be,** ئەگەر پێویست بێت.
**needful** (nēd'fəl), *adj.* (١) پێویست؛ پێویست بوون. (٢) [Archaic]، هەژار؛ دەستکورت؛ فەقیر.
**neediness** (nēd'i-nis), *n.* هەژاری؛ نەبوونی؛ دەستکورتی.
**needle** (nē'd'l), *n.* (١) دەرزی. (٢) شیش (چنین). (٣) دەرزی سنووقی قەوان. (٤) دەرزی موگناتیسی قیبلەنما. (٥) میلی پلە پیشاندەر (هەموو جۆرە ئامێرێکی پێوەر). (٦) دەرزی پزیشکەوانی؛ شرینقە. (٧) دەرزی کارەبایی. (٨) شتێکی نووکداری لە دەرزی چوو.
*v.t.* (١) دروومان کردن؛ دوورین؛ دەرزی پیاکردن‌و کونکردن؛ چنین. (٢) [Colloq.]، (ا) هاندان؛ پاڵ پێوەنان؛ تێوەژەندن. (ب) کلك پێوەکردن؛ سەرخستنەسەر؛ تیز پێوەکردن. (٣) [Slang]، خواردنەوە خەستکردن بە تێکردنی کحوول.
*v.i.* دوورین؛ دروومان؛ چنین.
**look for a needle in a haystack,** بۆ شتێك گەڕان کە هەرگیز لەوانە نەبێ بدۆزرێتەوە.
**needlefish** (nē'd'l-fish'), *n.* دەرزییە ماسی: ماسییەکی لموز تیژی ددان تیژە لە بۆری دەچێ.
**needless** (nēd'lis), *adj.* پێ نەویست؛ پێویست ناکات:
*( ~ work, suffering, trouble, etc.; N~ to say, he kept his promise.)*
**needlewoman** (nē'd'l-woom'ən), *n.* بەرگدرووی ژن؛ ئافرەتی نەقشکار.
**needlework** (nē'd'l-wūrk'), *n.* دەرزیکاری؛ دەرزیو دروومان؛ نەقشکاری.
**needn't** (nēd''nt), = **need not.** پێویست ناکات.
**needs** (nēdz), *adv.* پێویستە؛ بە ناچاری: *( He must ~ obey.)*.
**needy** (nēd'i), *adj.* هەژار؛ دەستکورت؛ بێ دەرامەت؛ لات؛ فەقیر.
**ne'er** (nâr), *adv.* [Poetic], = **never.**
**ne'er-do-well** (nâr'doo-wel'), *n.* کەسێکی نالەبار؛ کەسێکی هیچ بە هیچ نەکەر
*adj.* بێ فەڕ؛ بێ کەڵك؛ هیچ بە هیچ نەکەر.
**nefarious** (ni-fâr'i-əs), *adj.* زۆر بەد؛ زۆر خراپ؛ زۆر ناپەسەند؛ زۆر ناڕەوا.
**negate** (ni-gāt', nē'gāt), *v.t.* (١) حاشا (لێ) کردن. (٢) لەکارخستن؛ لە کاریگەری کەمکردنەوە؛ بۆش کردنەوە.
**negation** (ni-gā'shən), *n.* (١) حاشاکاری؛ حاشاکردن؛ بەدرۆخستنەوە. (٢) بڕوا نەبوون؛ بڕوای دژ؛ وەڵامی دژ. (٣) نەبوون: *( Death is nothing more than the ~ of life.)*
**negative** (neg'ə-tiv), *adj.* (١) نەء؛ نا. (٢) دژ بە هەمووشت: *( a ~ person, personality, etc.)* (٣) نیشانەی نەخۆشی دەرناخات:
*( The results of the blood test were ~ .)*
(٤) ژمارەی لە سفر کەمتر (ژمارەوپێوان)؛ ژمارەی لێ دەرکراو. (٥) سارد (کارەبا).
*n.* (١) نەء؛ نا. (٢) حاشاکاری؛ حاشا. (٣) ڕای بەرپەرچدەرەوە؛ ڕای دژ؛ دژ وەستاو:
*( The ~ won the debate.)*
(٤) مافی ڤیتۆ. (٥) سەری سارد (کارەبا). (٦) ژمارەی لە سفر کەمتر؛ ژمارەی لێ دەرکراو. (٧) جام (وێنەگرتن).
*v.t.* (١) دژ وەستان؛ ڤیتۆدان. (٢) حاشاکردن؛ بەرپەرچدانەوە. (٣) بەدرۆخستنەوە. (٤) پووچکردنەوە؛ بەربەرەکانی کردن؛ بەرامبەر وەستان.

**in the negative,** به پێچەوانە؛ را لەسەر نەبوون؛ پەسەندنەکردن.
***( to answer in the negative)***
**-negatively** ***(adv.)***; **negativity; negativeness** ***(n.)***.
**negativism** (neg′ə-tiv-iz'm), ***n.*** (١) گومان بوون لە بیروڕای ئاینیو فەلسەفی؛ بێ بڕوایی (ئاین، فەلسەفە). (٢) دژی هەمووشت وەستان؛ پەسەندنەکردنی بیروڕاو خواستی هیچ کەس؛ هیچ شتێك بە دڵ نەبوون.
**-negativist** ***(n.)***; **negativistic** ***(adj.)***.
**neglect** (ni-glekt′), ***v.t.*** (١) گوێ پێ نەدان؛ بایەخ پێ نەدان؛ خستنە پشت گوێ. ***( They ~ed his warning.)***
(٢) زۆر گوێ پێ نەدان؛ بە تەنگەوە نەهاتن:
***( She ~ed her appearance.)***
(٣) کەمتەرخەمی کردن؛ لەبیرچوون؛ نەکردن؛ فەراموش کردن:
***( He ~ed to pay his telephone bill.)***
***n.*** (١) کەمتەرخەمی؛ فەراموشی؛ گوێ پێ نەدان؛ خستنە پشت گوێ.
(٢) خرانە پشت گوێ؛ گوێ پێ نەدران.
**-neglecter; neglector** ***(n.)***.
**neglectful** (ni-glekt′fəl), ***adj.*** گوێ پێ نەدەر؛ کەمتەرخەم:
***( He is ~ of his appearance.)***
**negligee, negligé** (neg′li-zhā′, neg′li-zhā′), ***n.*** (١) کراسی تەنکی شەوی ئافرەت. (٢) جلی ناومالی ئافرەت.
**negligence** (neg′li-jəns), ***n.*** (١) کەمتەرخەمی؛ فەراموشی؛ گوێ پێ نەدان ***( The accident was due to ~ .)***
(٢) ئەنجامی کەمتەرخەمی.
**negligent** (neg′li-jənt), ***adj.*** کەمتەرخەم؛ گوێنەدەر؛ بێباك:
***( He was ~ of his duties.)***
**negligible** (neg′li-jə-b'l), ***adj.*** کەم؛ هیچوپووچ؛ هیچ:
***( a ~ quantity; The difference between the two is ~ .)***
**negotiable** (ni-gō′shi-ə-b'l, ni-gō′shə-b'l), ***adj.*** (١) گفتوگۆی لەسەر دەکرێ؛ وتووێژی لەسەر دەکرێ. (٢) دەتوانرێ بدرێ بە کەسێکی تر (بانقەنۆت، چەك)؛ دەتوانرێ بگۆڕدرێتەوە بە پارە:
***( a ~ check, banknote, etc.)***
**-negotiability** ***(n.)***.
**negotiate** (ni-gō′shi-āt′), ***v.i.*** گفتوگۆکردن؛ وتووێژکردن.
***v.t.*** (١) بڕینەوە بە گفتوگۆ؛ لەسەر ڕێکەوتن بە گفتوگۆ: ***( to ~ a treaty)*** .
(٢) دان بە کەسێکی تر (چەك)؛ گۆڕینەوە (بانقەنۆت، چەك).
(٣) [Colloq.]. سەرکەوتن بەسەر کۆسپدا (ڕێگاوبان)؛ کردن یا پێداڕۆیشتن بەبێ وەرگەڕان ***( The driver was able to ~ the sharp curve.)*** .
**negotiation** (ni-gō′shi-ā′shən), ***n.*** often in plural, گفتوگۆ؛ وتووێژ.
**negotiator** (ni-gō′shi-ā′tēr), ***n.*** گفتوگۆکەر؛ وتووێژکەر.
**Negress** (nē′gris), ***n.*** ژنە قولەڕەش (لەڕووی سووکییەوە).
**Negro** (nē′grō), ***n.*** قولەڕەش؛ قول؛ ڕەش (مرۆڤ).
***adj.*** هی قولەڕەش؛ قولەڕەشی
**Negroid** (nē′groid), ***adj.*** قولەڕەشی؛ هی ڕەگەزی قولەڕەش.
***n.*** قولەڕەش؛ لە بنەچەی یا ڕەگەزی قولەڕەشە.
**Negrophile, Negrophil** (nē′grə-fīl′, nē′grə-fil′), ***n.*** حەز لە قولەڕەش کەر؛ لایەنگری قولەڕەشان
**Negrophobe** (nē′grə-fōb′), ***n.*** ناحەزی قولەڕەش؛ کەسێکە کە لە ڕەگەزی قولەڕەش دەترسێ یا ڕقی لێ دەبێتەوە.
**Negrophobia** (nē′grə-fō′bi-ə), ***n.*** ترسی قولەڕەش؛ ترس و ڕق بوون لە قولەڕەش
**neigh** (nā), ***v.i.*** حیلاندن؛ حیلەحیل کردن
***n.*** حیلە؛ حیلەحیل
**neighbor, neighbour** (nā′bēr), ***n.*** (١) دراوسێ؛ هاوسێ؛ دەرودراوسێ. (٢) هاوسنوور.
(٣) مرۆڤ؛ کەس؛ ئادەمیزاد.
***adj.*** تەنیشت؛ هاوسنوور.
***v.t.*** (١) دراوسێ بوون؛ لە تەنیشتەوە ژیان؛ بە تەنیشتەوە بوون.
(٢) [Rare]، لێ نزیك کردنەوە.
***v.i.*** (١) دراوسێ بوون؛ بە تەنیشتەوە بوون.
(٢) ( **~ with** ) هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ؛ هەستی دراوسێیەتی بوون لەگەڵدا؛ ڕووخۆش بوون لەگەڵدا
**neighborhood** (nā′bēr-hood′), ***n.*** (١) [Rare]، هەستی دراوسێیەتی. (٢) دراوسێیەتی. (٣) گەڕەك: ***( an attractive ~ )*** .
(٤) خەڵکی گەڕەك؛ دانیشتووانی گەڕەك.
**in the neighborhood of,** [Colloq.]. (١) نزیك؛ نزیك شوێنێك
(٢) نزیکەی: ***( We paid in the neighborhood of ten thousand dollars for the car.)***
**neighboring** (nā′bēr-iŋ), ***adj.*** هاوسێن؛ دراوسێن؛ نزیك؛ هاوسنوور.
**neighborliness** (nā′bēr-li-nis), ***n.*** دراوسێیەتی؛ هەستی دراوسێیەتی.
**neighborly** (nā′bēr-li), ***adj.*** وەك دراوسێ؛ دراوسێیانە؛ ڕووخۆش و ڕێك و پێك: ***( ~ relations)*** .
**neighbour** (nā′bēr), ***n.*** = **neighbor.**
**neither** (nē′thēr, nī′thēr), ***adj.*** ***( Use ~ hand.)*** هیچیان (دوان):
***pron.*** هیچیان؛ هیچ کامیان (دوان):
***( N~ of the reasons is adequate.)***
***conj.*** (١) نە... نە؛ نە ئەمو نە ئەو: ***( He can ~ read nor write.)*** .
(٢) هەروەها نە: ***( He doesn't smoke, ~ does he drink.)*** .
***adv.*** [Dial or Colloq.]. هەروەها؛ – یش:
***( If she won't go, I won't ~ .)***
**Nemesis** (nem′ə-sis), ***n.*** (١) بانوخوای تۆڵەسەندن (ئەفسانەی یۆنان)
(٢) [n.]، (ا) تۆڵە؛ سزای ڕەوا. (ب) تۆڵەسەند (هی خۆ یا خەڵك)؛ سزادەر.
(٣) [n.]، (ا) مێمل؛ دوژمن؛ دوژمنی کۆڵنەدەر.
(ب) هاوچاوی بۆ نەبەزێنراو؛ هاوچاوی کۆڵنەدەر.
**neo-** (nē′ō, nē′ə), پێشگرێکە بەمانای: نوێ باو؛ تازەباو؛ نوێ؛ تازە:
***( Neoplatonism; neoclassic; neocolonialism)***
**neoclassic** (nē′ō-klas′ik), ***adj.*** کلاسیکی نوێ باو: شێوازێکە لە وێژەو هونەردا بریتییە لە زیندووکردنەوەو پەیڕەوی کردنی شێوازی کلاسیکی کۆن.
**-neoclassical** ***(adj.)***.
**neolith** (nē′ə-lith′), ***n.*** ئامێری بەردینی دوادوای سەردەمی بەرد.
**neolithic** (nē′ə-lith′ik), ***adj.*** هی دوادوای سەردەمی بەرد؛ هی سەردەمی بەردی نوێ.
**neologism** (nē-ol′ə-jiz'm), ***n.*** (١) ووشەی تازە؛ ووشەی داڕێژراو یا داتاشراو؛ مانای تازەی ووشەی کۆن. (٢) ووشەی تازە داڕشتن یا داتاشین؛ بەکارهێنانی ووشەی تازەو داڕێژراو.
**-neological** ***(adj.)***; **neologist** ***(n.)***.
**neology** (nē-ol′ə-ji), ***n.*** = **neologism.**
**neomycin** (nē′ə-mī′sin), ***n.*** نیۆمایسین: دەرمانێکی دژ بە میکرۆبە.
**neon** (nē′on), ***n.*** گازی نیۆن.
**neon lamp,** گلۆپی شیری؛ گلۆپی نیۆن.
**neophyte** (nē′ə-fīt′), ***n.*** (١) نوێ بڕوا؛ تازە بڕواکەر (بە ئاین یا بیروڕای جیاواز لە هی خۆی). (٢) (ا) قەشەی تازە.
(ب) ئەندامی تازەی پەرستگایەك
(٣) نەوکار؛ نوێکار؛ تازەکوورە؛ فەریك؛ شاگرد.
**neoplasm** (nē′ə-plaz'm), ***n.*** بریتی دەرپۆقیوی تازە؛ لوو؛ دوومەڵ؛ ئاوساوی (لە گیاندار یا ڕووەکدا).
**Neoplatonism** (nē′ō-plā′t'n-iz'm), ***n.*** فەلسەفەی ئیفلاتۆنی-

تازه فەلسەفەیەکی سەدەی سێهەمە بریتی‌یە لە لێکدانی فەلسەفەی ئیفلاتوونو فەیلەسوفەکانی تری یۆنانو هەندێ بیروباوەڕی ئاینی جوولەکەو سۆفیتی‌و خاچ پەرستی

**neoprene** (nē′ə-prēn′), *n.* جۆرە لاستیکێکی دەستکردە.

**neoteric** (nē′ə-ter′ik), *adj.* نوێ؛ تازەباو؛ تازە داهێنراوە.

*n.* مرۆڤی تازەباو؛ نووسەری تازەباو؛ نووسەری تازە؛ مرۆڤی مێشك کراوە.

**nepenthe** (ni-pen′thi), *n.* (١) دەرمانی خەم ڕەوێن؛ دەرمانی خەمو خەفەت کوژ (کە لە کۆندا بەکاردەهێنرا). (٢) خەم ڕەوێن؛ خەم لەبیربەرەوە.

-nepenthean *(adj.).*

**nephew** (nef′ū), *n.* (١) (ا) برازاو خوشکەزای نێرینە؛ کوڕی براو خوشك. (ب) کوڕی ژن خوشكو ژن براو شوو براو دش.
(٢) زۆنە کوڕی پیاوێکی ئاینی گەورەی وەك سەرەك قەشە.

**nepho-** (nef′ō, nef′ə), پێشگرێکە بەمانای: هەور. ***(nephology)*** .

**nephology** (ni-fol′ə-ji), *n.* هەورناسی؛ زانستی هەور

**nephoscope** (nef′ə-skōp′), *n.* ئامێری پێوانی بەرزی‌و خێرایی‌و ڕووی هەڵکردنی هەور.

**nephr-,** = **nephro-** .

**nephralgia** (ne-fral′ji-ə), *n.* ئازاری گورچیلە.

**nephrectomy** (ne-frek′tə-mi), *n.* گورچیلە دەرهێنان یا بڕین (نەشتەرکاری).

**nephridium** (ne-frid′i-əm), *n.* (١) ئەو ئەندامەی کاری گورچیلە دەکات لە گیانداری بێ بڕبڕەدا وەك کرم. (٢) ئەو ئەندامەی کاری گورچیلە دەکات لە ئاوڵەمەی گیانداری بێ بڕبڕەداو دەبێت بە گورچیلە.

**nephrite** (nef′rīt), *n.* بەردێکی بەنرخی سپی یا سەوزە.

**nephritic** (ne-frit′ik), *adj.* (١) گورچیلەیی.
(٢) نەخۆشی گورچیلەی هەیە

**nephritis** (ne-frī′tis), *n.* نەخۆشی گورچیلە؛ گورچیلە ئاوسان.

**nephro-** (nef′rō, nef′rə), *Also* **nephr-,** پێشگرێکە بەمانای: گورچیلە

**nephrosis** (ne-frō′sis), *n.* نەخۆشی گورچیلە (بەبێ ئاوسانی)؛ پووکانەوەی گورچیلە.

**nephrotomy** (ne-frot′ə-mi), *n.* هەڵدڕینی گورچیلە بۆ بەرد لێ دەرهێنانی.

**nepotism** (nep′ə-tiz′m), *n.* خاترگرتنی نابەجێی خزموخوێش بە دامەزراندنیان لەسەر ئیشی چاك (لەلایەن کاربەدەستێکەوە).

-nepotist *(n.).*

**Neptune** (nep′tōōn, nep′chōōn), *n.* (١) خوای دەریا (ئەفسانەی ڕۆمانی). (٢) دەریا. (٣) نیپتون: سێهەم ئەستێرەی گەڕۆکە لە گەورەییداو هەشتەمە لە دووری‌یەوە لە خۆر.

**nervation** (nūr-vā′shən), *n.* نەخشەی دەماری گەڵایەك یا باڵی جانەوەرێك.

**nerve** (nūrv), *n.* (١) ماسولکە؛ بازوو؛ ماسولکەژێ.
(٢) هەستەدەمار؛ دەمار؛ پەی.
(٣) دڵ بەخۆدا گرتن؛ ئازایی؛ چاونەترسان: ***(a man of ~)*** .
(٤) هێز؛ تین
(٥) [Colloq.]، ڕووهاتن؛ ڕووقایمی؛ بێ شەرمی؛ بێ ئابڕوویی؛ چارقایمی؛ بێ حەیایی: ***(She had the ~ to accuse me of laziness.)*** .
(٦) دەماری گەڵاو باڵی جانەوەر.

*v.t.* تین پێدان؛ هێز پێدان؛ بەهێزکردن

**get on one's nerves,** [Colloq.], پەستکردن؛ تووڕەکردن:
***(He gets on my nerves.)***

**strain every nerve,** زۆر هەوڵدان؛ بە ئەوپەڕی تواناوە هەوڵدان.

**nerve cell,** شانەی هەستەدەمار

**nerve center,** (١) کۆمەڵە هەستەدەماری هاوفرمان.
(٢) جێی فەرماندەرێتی؛ ناوجەرگەی دەسەڵات و فەرماندەری.

**nerve fiber,** ڕیشاڵی هەستەدەمار.

**nerve gas,** ژەهرەگازی هەستەدەمار؛ ژەهرەگازی مێشك.

**nerveless** (nūrv′lis), *adj.* (١) بێ هێز؛ بێ تین؛ سست؛ خاو؛ مردوو (مەجان). (٢) نەشڵەژاو؛ بە ئارامو ئازا؛ دان بەخۆداگر.

**nerve-racking, nerve-wracking** (nūrv′rak′iŋ), *adj.* ناخۆش؛ پەستکەر؛ گران؛ بێ تاقەتکەر؛ پڕ لە سەرئێشە:
***(a ~ situation, job, etc.)***

**nervous** (nūr′vəs), *adj.* (١) بەهێز؛ بازوو بەهێز. (٢) بەجۆش.
(٣) هەستەدەماری؛ تایبەتی بە هەستەدەمار. (٤) شڵەژاو؛ شپرزە؛ پەشۆکاو؛ بە جرت‌وفرت؛ قوشقی؛ بێ ئارامی. (٥) ترساو؛ ترسدار؛ مەترسیدار.

**nervous breakdown,** پووخان (کۆئەندامی هەستەدەمار، مێشك)؛ هەرەس بردنی کۆئەندامی هەستەدەمار؛ پەککەوتنی کۆئەندامی هەستەدەماری مرۆڤو هەرەس بردنی بەهۆی خورپەو باری ناخۆشی ژیانەوە.

**nervous system,** کۆئەندامی هەستەدەمار.

**nervure** (nūr′vyoor), *n.* دەماری گەڵاو باڵی جانەوەر.

**nervy** (nūr′vi), *adj.* (١) [Rare] ، بەهێز؛ بەهێزوبازوو.
(٢) [British]، شپرزە؛ بە جرت‌وفرت؛ پەشۆکاو؛ قوشقی. (٣) ئازا؛ بەجەرگ؛ چاونەترساو. (٤) [Slang]، بێ حەیا؛ بێ شەرم؛ ڕووقایم؛ چارقایم.

**nescience** (nesh′əns, nesh′i-əns), *n.* (١) نەزانی؛ نەزانین؛ تێنەگەیشتن. (٢) بێ بڕوایی بە خوا؛ بڕوا بە خوا نەبوون.

-nescient *(adj.).*

**ness** (nes), *n.* سەرزەوی بەرزی دەرپۆقیو بۆ ناو دەریا.

**- ness** (nis, nəs), پاشگرێکە بەمانای: بوون؛ بار؛ چۆنێتی؛ – ی:
***(greatness, sadness, kindness, etc.)***

**nest** (nest), *n.* (١) هێلانە. (٢) کونجی حەوانەوە.
(٣) (ا) لانە (بەتایبەتی لەڕووی خراپی‌یەوە)؛ پەناگا.
(ب) ئەوانەی هاتوچۆی لانەیەکی وەها دەکەن یا تێیدا دەژین:
***(a ~ of ciminals)***
(٤) پۆل (باڵندە، جانەوەر).
(٥) دەستەیەك شتی قەبارە جیا جیا کە دەخرێتە ناو یەکەوەو کەڵەکە دەکرێن (وەك سنووق، مێز... هتد).

*v.i.* (١) هێلانەکردن؛ نیشتن لە هێلانەدا. (٢) ڕاوکردن لە هێلانەدا.

*v.t.* (١) هێلانە بۆ کردن. (٢) خستنە هێلانەوە؛ نیشتن لە هێلانەدا.

**nest egg,** (١) ڕاوکە. (٢) پاشەکەوت؛ قایمەکاری.

**nestle** (nes′'l), *v.i.* (١) پاڵ لێدانەوە؛ پاڵدانەوە؛ نیشتن:
***(to ~ down in bed)***
(٢) چوونە باوەش؛ باش لێ نزیك بوونەوە: ***(She ~d up to him.)*** .
(٣) لە کونجێکی باشدا بوونو پارێزران یا دەورەدران:
***(The house ~d among the trees.)***
(٤) [Rare]، نیشتن (لە هێلانەدا).

**nestling** (nest′liŋ, nes′liŋ), *n.* (١) زەڕنەقووتە.
(٢) منداڵی ساوا؛ منداڵ.

**net** (net), *n.* (١) (ا) تۆڕ. (ب) تۆڕی ماسی گرتن. (٢) داو؛ تەڵە.
(٣) تۆڕی یاری (تەنس، باسکە، باڵە). (٤) تۆپی بەر تۆڕ کەوتوو (تەنس، باڵە)

*v.t.* (١) کردن بە تۆڕ؛ تۆڕ درووستکردن. (٢) بە تۆڕ گرتن؛ ڕاوکردن بە تۆڕ.
(٣) پاراستن بە تۆڕ؛ دەورگرتن بە تۆڕ. (٤) لە تۆڕدان (تەنس، باڵە).

*v.i.* تۆڕکردن؛ تۆڕ درووستکردن.

*adj.* (١) تۆڕی؛ وەك تۆڕ. (٢) بە تۆڕ گیراو؛ بە داوەوە بوو.

**net** (net), *adj.* (١) سافی (مووچە، دەسکەوت، قازانج، کێش، بار):
***(~ profit, salary, weight, etc.)***
(٢) دوا؛ هەرە دوایی: ***(~ result)*** .

*n.* سافی (مووچە، دەسکەوت، قازانج، قورسی، بار):
***(We had a ~ of one thousand dollars.)***

*v.t.* دەسکەوتن بە سافی؛ بۆ مانەوە بە سافی:
***(He ~ted one hundred dollars from the sale.)***

**nether** (ne*th*′ẽr), *adj.* (١) هی ژێرزەمین؛ خواروو: ***(the ~ world)*** . (٢) ژێرەوە؛ هی ژێرەوە: ***(~ garments)*** .

**nethermost** (ne*th*′ẽr-mōst′, ne*th*′ẽr-məst), *adj.* نزمترین؛ خوارووترین؛ ژێرترین.

**nether world,** (١) دۆزەخ. (٢) ئەوەودنیا؛ شوێنی مردووان. (٣) شوێنێك یا بارێکی لە دۆزەخ چوو.

**netting** (net′iŋ), *n.* (١) (ا) تۆڕ دروستکردن. (ب) ڕاوکردن بە تۆڕ؛ گرتن بە تۆڕ کردن بە داوەوە. (٢) تۆڕ. (٣) نێچیری بە تۆڕ گیراو.

**nettle** (net′'l), *n.* (١) دڕك. (٢) ڕووەکی دڕکاوی.

***v.t.*** (١) دڕك پێداکردن. (٢) پەستکردن؛ تووڕەکردن.

**nettle rash,** گەرمەژنەو ئیری ئالۆشاوی یا بە خوروو.

**network** (net′wûrk′), *n.* (١) تۆڕ؛ تەنراو. (٢) چەند شتێکی لێکدراوو پێکەوە بەستراوی وەك تۆڕ (ڕێگاوبان)؛ دەستەی پەیوەندیدار: ***(a ~ of railways, highways, friends, etc.)***

(٣) چەند ئێستگەیەکی ڕادیۆ یا تەلەفزیۆنی پێکەوە بەستراو؛ دەزگایەکی وەها: ***(a television ~)***

**neur-,** = **neuro-**

**neural** (noor′əl, nyoor′əl), *adj.* هی هەستەدەمار؛ هی کۆئەندامی هەستەدەمار.

**neuralgia** (noo-ral′jə, nyoo-ral′jə), *n.* ئازاری هەستەدەمار.

**neurasthenia** (noor′əs-thē′ni-ə, nyoor′əs-thē′ni-ə), *n.* (١) ماندووبوون و بێ هێزی هەستەدەمار. (٢) جۆرە نەخۆشییەکی کۆئەندامی هەستەدەمارە نیشانەکانی ماندوویتی و دڵەڕاوکێ و پەستی و ئازارە.

**neurectomy** (noo-rek′tə-mi, nyoo-rek′tə-mi), *n.* بڕین و لابردنی هەستەدەمار (نەشتەرکاری).

**neurilemma** (noor′i-lem′ə, nyoor′i-lem′ə), *n.* کیفی تەنکی دەوری هەستەدەمار.

**neuritis** (noo-rī′tis, nyoo-rī′tis), *n.* هەوکردن یا داگیرسانی هەستەدەمار

**neuro-** (noor′ō, nyoor′ə), *Also* **neur-,** پێشگرێکە بەمانای: هەستەدەمار؛ کۆئەندامی هەستەدەمار.

**neuroglia** (noo-rog′li-ə, nyoo-rog′li-ə), *n.* ڕیشاڵێکی تایبەتییە شانەکانی کۆئەندامی هەستەدەمار پێکەوە دەبەستێ و ڕاگیریان دەکا.

**neurologist** (noo-rol′ə-jist, nyoo-rol′ə-jist), *n.* پزیشکی کۆئەندامی هەستەدەمارو نەخۆشییەکانی؛ پزیشکی مێشك.

**neurology** (noo-rol′ə-ji, nyoo-rol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی کۆئەندامی هەستەدەمارو پێکهاتنی و نەخۆشییەکانی؛ هەستەدەمارناسی.

**-neurological** *(adj.).*

**neuroma** (noo-rō′mə, nyoo-rō′mə), *n.* دوومەڵ یا بڕینی هەستەدەمار

**neuron, neurone** (noor′ōn, nyoor′ōn), *n.* شانەی هەستەدەمار

**neuropath** (noor′ə-path′, nyoor′ə-path′), *n.* کەسێکە کە بە زگماکی نەخۆشی کۆئەندامی دەماری لەگەڵدایە.

**neuropathology** (noor′ō-pə-thol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی کۆئەندامی هەستەدەمار.

**neuropathy** (noo-rop′ə-thi, nyoo-rop′ə-thi), *n.* نەخۆشی کۆئەندامی هەستەدەمار.

**neurosis** (noo-rō′sis, nyoo-rō′sis), *n.* مێشك تێکچوون؛ نەخۆشی کۆئەندامی هەستەدەمارە کە دەبێتە هۆی ڕەفتاری نائاسایی شێتانەو دڵەخورتەو ترسێکی زۆرو ووڕك گرتن لە کردنی شت؛ جۆرێکە لە شێتی.

**neurosurgery** (noor′ō-sûr′jẽr-i), *n.* نەشتەرکاری کۆئەندامی هەستەدەمار

**neurotic** (noo-rot′ik, nyoo-rot′ik), *adj.* (١) هی هەستەدەمار؛ تایبەتی بە هەستەدەمار: ***(a ~ disorder)*** . (٢) نەخۆشی " neurosis " ی لەگەڵە؛ شێت: ***(a ~ patient)*** .

***n.*** کەسێکە کە نەخۆشی " neurosis " ی لەگەڵە؛ کەسێکی شێت.

**neurotomy** (noo-rot′ə-mi, nyoo-rot′ə-mi), *n.* هەستەدەمار بڕین یا پچڕاندن بۆ ئازار کەمکردنەوە (نەشتەرکاری).

**neuter** (nōō′tẽr, nū′tẽr), *adj.* (١) [Archaic]، بێ لایەن. (٢) (ا) بێ ئەندامی زاووزێ؛ نە نێرو نە مێ. (ب) ئەندامی زاووزێی ناتەواوە. (٣) (ا) نە نێرو نە مێ (ڕێزمان)؛ بێ گیان (ووشە). (ب) تێنەپەڕ (کردار).

***n.*** (١) گیانداری خەساو. (٢) [Archaic] کەسێك یا دەستەیەکی بێ لایەن. (٣) گیاندار یا ڕووەکی نە نێرو نە مێ؛ گیاندار یا ڕووەکی ئەندامی زاووزێ ناتەواو. (٤) ووشەی بێ گیان (ڕێزمان)؛ ووشەی نە نێرو نە مێ.

**neutral** (nōō′trəl, nū′trəl), *adj.* (١) بێ لایەن (مرۆڤ، وولات)؛ لاشەڕ. (٢) هی وولاتی بێ لایەن. (٣) بێ ڕەنگ؛ ڕەنگێکی تایبەتی نییە: ***(a ~ color)*** . (٤) بێ نێرك و نێرەك (ڕووەکناسی). (٥) نە ترشەڵۆکی و نە قڵیەیی (کیمیا). (٦) نە سارد و نە گەرم (کارەبا)؛ تەووژمی کارەبای لەسەر نییە. (٧) هێز نەخراوە سەر (تیپە بزوێن). (٨) نە نێرو نە مێ؛ ئەندامی زاووزێی ناتەواوە.

***n.*** (١) وولاتی بێ لایەن. (٢) مرۆڤی بێ لایەن؛ هاوولاتی وولاتێکی بێ لایەن (٣) ڕەنگێکی بێ ڕەنگ؛ ڕەنگێکە کە ڕەنگێکی تایبەتی نەبێ. (٤) بۆش (گێڕی ئوتومبیل و مەکینە).

**neutralism** (nōō′trəl-iz′m, nū′trəl-iz′m), *n.* نەچوونە ناو پەیمانی جەنگەوە؛ بێ لایەنی وولات؛ لاشەڕی.

**-neutralist** *(n.).*

**neutrality** (nōō-tral′ə-ti, nū-tral′ə-ti), *n.* بێ لایەنی وولات؛ نەچوونە ناو پەیمانی جەنگەوە؛ لاشەڕی.

**neutralize** (nōō′trə-līz′, nū′trə-līz′), *v.t.* (١) بێ لایەن کردن (وولات)؛ بوون بە بێ لایەن. (٢) (ا) هاوتاکردن. (ب) لەکارخستن؛ بۆش کردن؛ بەتاڵ کردنەوە (کاریگەری شتێك). (٣) لە کاریگەری خستن (کیمیا)؛ لە ترشەڵۆکی و قڵیەیی خستن. (٤) تەووژمی کارەبا لەسەر لادان.

**-neutralization** *(n.).*

**neutron** (nōō′tron, nū′tron), *n.* نیوترۆن (فیزیا): گەردیلەی بێ تەووژمی کارەباو بە قەوارەی " پرۆتۆن " ێك.

**never** (nev′ẽr), *adv.* هەرگیز؛ هیچ کات؛ هیچ کاتێك؛ قەت؛ بە هیچ جۆرێك؛ بڕای بڕای؛ هیچ.

**nevermore** (nev′ẽr-môr′, nev′ẽr-mōr′), *adv.* بڕای بڕای؛ هەرگیزاو هەرگیز؛ ئیتر قەت؛ هەرگیز لەمەودوا.

**nevertheless** (nev′ẽr-*th*ə-les′), *adv.* لەگەڵ ئەوەشدا؛ هێشتا.

**nevus** (nē′vəs), *n.* خاڵ (پێست).

**new** (nōō, nū), *adj.* (١) تازە؛ نوێ. (٢) (ا) تازە دۆزراوە. (ب) تازە بینراو؛ تازە سەرنج پێدراو. (ج) تازە؛ سەیر؛ پێ ڕانەهاتوو (٣) نەشارەزا؛ نەوکار؛ تازە؛ ڕانەهاتوو: ***(He is ~ to the work.)*** . (٤) هی وەرزی تازە؛ تازە پێگەیشتوو: ***(~ potatoes)*** . (٥) تازە؛ هێشتا بەکارنەهێنراو یا لەبەرنەکراو؛ کۆن نەبوو. (٦) تازەباو؛ تازە داهاتوو؛ نوێ باو؛ هی ئەمڕۆ: ***(~ fashions)*** . (٧) هی تر؛ زیادە؛ هی تازە (٨) تازە؛ نوێ: ***(the ~ moon)*** . (٩) تازە هاتوو؛ تازە گەیشتوو؛ تازە: ***(a ~ arrival)*** . (١٠) [N-]، نوێ؛ هی سەدانی نوێ؛ لە دوای سەدانی ناوەڕاستەوە (زمان).

***adv.*** (١) دیسانەوە؛ سەرلەنوێ. (٢) لەم چەندانەدا؛ تازە؛ لەم دواییەدا.

**newborn** (nōō′bôrn′, nū′bôrn′), *adj.* تازە لەدایکبوو.

**newcomer** (nōō′kum′ẽr, nū′kum′ẽr), *n.* تازە هاتوو؛ تازە گەیشتوو.

**newel** (nōō′əl, nū′əl), *n.* (١) سنگی ناوەڕاستی محاجەرەی پێ پلیکانە کە پێ پلیکانەکە پێچی تێدا دەکاتەوە. (٢) سنگی محاجەرەی پێ پلیکانە.
**newfangled** (nōō′faŋ′g'ld, nū′faŋ′g'ld), *adj.* (١) تازەباو، تازە داهاتوو؛ نوێ باو؛ تازە پەیدابوو: *( ~ ideas)* . (٢) مۆدەی تازە پەرست (لەڕووی سووکیەوە)؛ زۆر حەز لە شتی تازەباوکەر.
**newfashioned** (nōō′fash′ənd, nū′fash′ənd), *adj.* (١) تازە بووە بە باو؛ تازەباو؛ تازە پەیدابوو. (٢) شێوە تازە؛ لەسەر شێوازی تازە کراو.
**newish** (nōō′ish, nū′ish), *adj.* نەختێك تازە؛ نیمچە تازە.
**New Latin,** لاتینی تازە: زمانی لاتینی لە سەردەمی بزووتنەوەی ئەورووپاوە بەتایبەتی زمانی زانستی.
**newly** (nōō′li, nū′li), *adv.* (١) تازە؛ زۆری پێ نەچووە؛ نوێ: *( ~ baked bread)* (٢) سەرلەنوێ؛ دیسانەوە. (٣) بەشێوەیەکی تازە.
**newlywed** (nōō′li-wed′, nū′li-wed′), *n.* تازە بووك؛ تازە زاوا؛ نوێ بووك؛ نۆ بووك.
**new moon,** (١) نوێ مانگ؛ مانگی تازە؛ مانگی دەمەداسی؛ نۆ مانگ. (٢) کاتی نوێ مانگ.
**news** (nōōz, nūz), *n.pl.* (١) دەنگوباس (بەتایبەتی هی ناو ڕۆژنامەو سەر رادیۆو تەلەفزیۆن)؛ هەواڵ (٢) سەرجەمی دەنگوباسی بڵاوکراوە. (٣) دەنگوباسی تازەو هێشتا نەبیستراو: *( That's ~ to me.)* . (٤) ڕۆژنامە
**news agency,** ئاژانس (کە دەنگوباس دەدات بە ڕۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن)
**newsboy** (nōōz′boi′, nūz′boi′), *n.* ڕۆژنامەفرۆش (منداڵ)؛ ڕۆژنامەبەر بۆ ماڵی خەڵك.
**newsbreak** (nōōz′brāk′, nūz′brāk′), *n.* دەنگوباسێکی گرنگی کوتوپڕ؛ دەنگوباسی پەلە.
**news bulletin,** دەنگوباسی سەر رادیۆوتەلەفزیۆن (بەتایبەتی هی گرنگ).
**newscast** (nōōz′kast′, nūz′käst′), *n.* ژەمێك دەنگوباسی سەر رادیۆو تەلەفزیۆن؛ جارێك دەنگوباسی لەسەر رادیۆو تەلەفزیۆن بڵاوکراوە.
**newscaster** (nōōz′kas′tēr, nūz′käs′tēr), *n.* دەنگوباس خوێنەرەوە (لەسەر رادیۆو تەلەفزیۆن)؛ دەنگوباس بڵاوکەرەوە.
**news conference,** کۆنفرانسی ڕۆژنامەگەری؛ کۆڕی ڕۆژنامەگەری
**newsletter** (nōōz′let′ēr, nūz′let′ēr), *n.* دەنگوباسنامە (کە ناو– بەناو لایەك دەری دەکات)؛ پەیامنامە.
**newsman** (nōōz′man′, nūz′mən), *n.* (١) ڕۆژنامەچی؛ ڕۆژنامەگەر؛ دەنگوباس کۆکەرەوە بۆ ڕۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن. (٢) ڕۆژنامەفرۆش.
**newsmonger** (nōōz′muŋ′gēr, nūz′muŋ′gēr), *n.* دەنگوباس هێنەرو بنەر؛ قاوخەرەوە.
**newspaper** (nōōz′pā′pēr, nūz′pā′pēr), *n.* ڕۆژنامە
**newsreel** (nōōz′rēl′, nūz′rēl′), *n.* فیلمی دەنگوباس.
**newsroom** (nōōz′rōōm′, nūz′room′), *n.* (١) ژووری دەنگوباس: ژوورێکە لە دەستگایەکی ڕاگەیاندندا کە دەنگوباسی تێدا ئامادە دەکرێ بۆ لە چاپدانی یا بڵاوکردنەوەی. (٢) ژوورێکی وەها لە ئێستگەی رادیۆو تەلەفزیۆندا.
**newsstall** (nōōz′stôl′, nūz′stôl′), *n.* = newsstand.
**newsstand** (nōōz′stand′, nūz′stand′), *n.* فرۆشگای ڕۆژنامە؛ ڕۆژنامەخانە
**newsworthy** (nōōz′wūr′thi, nūz′wūr′thi), *adj.* بە دەنگوباس دەژمێررێ؛ گرنگ (لەڕووی دەنگوباسەوە)؛ دەهێنێ پێی بوترێ "دەنگوباس" .
**newsy** (nōōz′i, nūz′i), *adj.* [Colloq.], پڕ لە دەنگوباس.
*n.* [Colloq.], ڕۆژنامەفرۆش (منداڵ).
**newt** (nōōt, nūt), *n.* قورناویلکە

**New Testament,** بەشی دووەمی ئینجیل؛ بەشی تازەی ئینجیل.
**Newtonian** (nōō-tō′ni-ən, nū-tō′ni-ən), *adj.* تایبەتی بە زانای ئینگلیز " نیوتن " و تیۆرییەکانی.
**New World,** جیهانی نوێ: ئەمەریکای باکوورو باشوور.
**new year,** (١) ( ~ the )، ساڵی تازە. (٢) سەری ساڵی تازە؛ جەژنی سەری ساڵ.
**New Year's Day,** یەکەم ڕۆژی ساڵی تازە؛ سەری ساڵی تازە.
**New Year's Eve,** شەوی سەری ساڵی تازە؛ جەژنی سەری ساڵی تازە؛ سەری ساڵی تازە.
**next** (nekst), *adj.* (١) تەنیشت: *( the ~ room)* . (٢) ئاینده؛ داهاتوو؛ دوایی؛ ئەوی تر: *( ~ Monday, the ~ train; the ~ president)*
*adv.* (١) داهاتوو؛ ئاینده؛ تر؛ پاشتر. (٢) ئەمجارە: *( when ~ I write)* .
*prep.* نزیك؛ بەتەنیشت؛ تەنیشت: *( Sit ~ to the tree.; ~ to my heart)*
  **next door (to),** لە ماڵ یا خانووەکەی تەنیشتیدا.
  **next to impossible,** هیچ لەوانە نییە ڕووبدات یا ببێ؛ بۆی نییە؛ زۆر گرانە.
  **next to nothing,** هیچ: *( He knows next to nothing about it.)*
**next-door** (neks′dôr′, neks′dōr′), *adj.* ئەوەی تەنیشت؛ تەنیشت: *( our ~ neighbor)* .
**next friend,** نوێنەری منداڵێك یا کەسێك کە نەتوانێ نوێنەریی خۆی لە دادگادا بکات.
**next of kin,** (١) نزیکترین خزم. (٢) (ا) نزیکترین خزمی مردوویەك. (ب) نزیکترین خزمی مردوویەك کە مافی میراتییان هەیە ئەگەر وەسیەتنامەی بەجێ نەهێشتبێ.
**nexus** (nek′sus), *n.* (١) پەیوەندی (نێوان ئەندامانی کۆمەڵێك یا نێوان چەند دەستەیەك). (٢) کۆمەڵەی پەیوەندیدار؛ زنجیرە.
**nib** (nib), *n.* (١) دەنووك. (٢) نووکە پاندان؛ نووکە پێنووس؛ نووکە نووچ؛ نووکی پێنووسی لە قەفی پەڕ دروستکراو. (٣) نووك (ئامێر). (٤) *(pl.)* دەنکە قاوە یا کاکاوی هاڕاو.
*v.t.* (١) تیژکردنو دووفاقەکردنی قەفی پەڕو کردنی بە پێنووس؛ تیژکردنی نووکی پێنووس. (٢) چاك کردنەوەی نووکە پێنووس. (٣) نووك کردن بە پاندانو نووچەوە.
**nibble** (nib′'l), *n.* (١) کرۆشتن؛ داکرۆشتن (وەك مشك)؛ قەپی بچووك بچووك لێگرتن. (٢) بە ئاستەم گازلێگرتن؛ گازی ئەسپایی لێگرتن؛ بە ئەسپایی قەپ لێگرتن (خۆشەویستی).
*v.i.* (١) قەپی بچووك بچووك لێگرتنو بە ترسەوە: *( The fish ~ed at the bait.)* (٢) مڕووموش کردن.
*n.* (١) قەپی بچووك (خواردن، خۆشەویستی)؛ قەپی بچووك گرتن. (٢) قەپێك خواردن؛ قەپاڵ.
**nibs** (nibz), *n.* [Colloq.], کەسێکی گرنگ؛ کەسێکی خۆ بە زل زان.
**nice** (nīs), *adj.* (١) بە قێزوبێز؛ بەناز؛ بە نازونووز. (٢) وورد؛ بە ئاستەم هەستی پێ دەکرێ: *( a ~ distinction)* . (٣) ئاسك (تەنگوچەڵەمە، بار، کاروبار): *( a ~ problem)* . (٤) (ا) وورد (مرۆڤ). (ب) وورد (ئامێر)؛ تەواو. (٥) (ا) باش؛ خۆش؛ چاك؛ دڵگیر؛ پەسەند؛ زۆر باش: *( a ~ person, house, town, meal, etc.)* (ب) جوان: *( a ~ girl)* . (ج) ڕێكوپێك؛ ڕەووشت جوان؛ ڕەفتار چاك؛ باش؛ چاك؛ ئاسك: *( a ~ person)* (د) جوان (شوێن)؛ ڕێكوپێك: *( a ~ room, office, etc.)* .

(٦) [Obs.]، (ا) نەزان؛ کەرو بێ مێشك.
(ب) داوێن پیس؛ سەرسەری. (ج) شەرمن؛ بە درۆوە شەرمن.
**nicely** (nīs′li), *adv.* (١) بە جوانی (٢) بە ووردی؛ بە تەواوی.
(٣) بە باشی؛ بە چاکی.
**nicety** (nī′sə-ti), *n.* (١) (ا) [Obs.]، کەرێتی؛ بێ مێشکی؛ نەزانی.
(ب) شەرمنی؛ شەرم (ج) تەرپۆشی لە ڕادە بەدەر. (د) ووردی؛ تەواوی.
(ه) قیزوبیز؛ ناز فرۆشتن؛ نازکردن. (٢) جوانی؛ باشی؛ ناسکی؛ خۆش.
(٣) شتی خۆش‌و جوان: *( to enjoy the ~ies of life)* .
(٤) وورده شتی بە ئاستەم هەستپێکراوی ڕەووشت:
***( the ~ies of table manners)***
**to a nicety,** بە تەواوی؛ بە ووردی
**niche** (nich), *n.* (١) تاق (لەناو دیواردا بۆ تیادانانی پەیکەرو گوڵدان)؛ خانە. (٢) کونج؛ کەنار؛ پەنا؛ قوژبن.
(٣) کونجێك یـ پیشەیەکی خۆش‌و گونجاو لەگەڵ تواناو ویستی کەسێکدا:
***( to find a ~ for oneself in life)***
(٤) دەوروبەری گونجاو بۆ پەرەسەندنی توخمە گیاندار.
***v.t.*** خستنە کونجێکەوە؛ لە پەنایەکدا دانان؛ خستنە تاقەوە؛ جێگەی باش بۆ دۆزینەوە.
**nick** (nik), ***v.t.*** (١) لەلەکردن؛ درزتێکردن؛ درز لێ هەڵکەندن؛ قلیش تێکردن (٢) ژماردن بەهۆی لەلەکردن یا قلیش تێکردنی ڕوویەکەوە.
(٣) لەکاتی خۆیدا هەڵسان بە کارێك؛ پێکان؛ دەست وەشاندن لەکاتی خۆیدا.
(٤) [British Slang]، گرتن (تاوانکار).
(٥) [Slang] خەڵەتاندن؛ گزی لێکردن.
***n.*** (١) لەلە؛ قلیش؛ درز: *( ~s in the table)* .
(٢) ژماردن بەهۆی لەلەکردن یا قلیش تێکردنی ڕوویەکەوە.
**in the nick of time,** لەکاتی خۆیدا؛ لە دوا هەناسەدا:
***( He showed up in the nick of time and rescued her.)***
**nickle** (nik′'l), *n.* (١) نیکل. جۆرە کانزایەکە.
(٢) نیکل: دراوی پێنج فلسی ئەمەریکا و کەنەدا.
***v.t.*** ڕووکەش کردن بە " نیکل " .
**nicker** (nik′ẽr), *n.* [British Dial.], (١) حیلە؛ لووشکەلووشك.
(٢) پێکەنین؛ زەردەخەنە.
***v.i.*** [British Dial.], (١) حیلاندن؛ لووشکەلووشك کردن.
(٢) پێکەنین؛ زەردەخەنەگرتن.
**nick-nack** (nik′nak′), *n.* = **nickknack.**
**nicknname** (nik′nām′), *n.* (١) نازناو (کە دەنرێ لە مرۆڤ، شوێن، یا شت لەڕووی خۆشەویستی یا سووکی‌یەوە): **( Fatty, Shorty, etc.)** .
(٢) نازناو (مرۆڤ):
(وەك Dave بۆ David ؛ Jim بۆ James ؛ Bob بۆ **Robert** ).
***v.t.*** (١) نازناولێنان. (٢) ناوی هەڵە لێنان؛ بە ناوی هەڵە بانگ کردن.
**nicotine** (nik′ə-tēn′, nik′ə-tin), *n.* نیکوتین. ژەهری توتن.
**nidificate** (nid′ə-fi-kāt′), *v.i.* هێلانەکردن.
**-nidification** *(n.).*
**nidify** (nid′ə-fī′), *v.i.* هێلانەکردن
**nidus** (nī′dəs), *n.* (١) هێلانە (بەتایبەتی هی جاڵجاڵۆکەو جانەوەر).
(٢) هێلانە یا جێی هەڵهێنان‌و پەرەسەندن: (ا) جێی پەیدابوون‌و پەرەسەندنی تەنی یەك شانەیی. (ب) جێی پەرەسەندنی میکرۆب؛ سەرچاوەی نەخۆشی.
**niece** (nēs), *n.* (١) برازا یا خوشکەزای مێینە؛ کچی برا یا خوشك.
(٢) کچی ژن خوشك‌و ژن براو شووبراو دش.
(٣) زۆڵە کچی پیاوێکی ئاینی گەورەی وەك قەشە لە سەدانی ناوەڕاستدا.
**niello** (ni-el′ō), *n.* (١) نل: دارێژەیەکی ڕەشە لە گۆگردو قورقوشم‌و زیوو مس پێکدێت. (٢) ڕووکەشکاری بەم دارێژەیە.
(٣) شتێکی ڕووکەش کراو بەم دارێژەیە.
***v.t.*** ڕووکەش کردن یا ڕازاندنەوە بەم دارێژەیە.
**nifty** (nif′ti), *adj.* [Slang], نایاب؛ باش‌و جوان‌و ڕێك‌وپێك (بەرگ)؛ چاك.
*n.* [Slang], قسەی قوت.
**niggard** (nig′ẽrd), *n.* کەسێکی ڕەزیل؛ کەسێکی پوولەکی.
*adj.* ڕەزیل؛ پوولەکی؛ پارەپیس؛ بەرچاوتەنگ.
**niggardly** (nig′ẽrd-li), *adj.* (١) ڕەزیل؛ پوولەکی.
(٢) کەم؛ نەختێك: *( a ~ sum)* .
*adv.* ڕەزیلانە؛ پوولەکی‌یانە؛ بە بەرچاوتەنگی
**-niggardliness** *(n.).*
**nigger** (nig′ẽr), *n.* قولەڕەش (لەڕووی سووکی‌یەوە).
**niggle** (nig′'l), *v.i.* (١) خۆ خەریك کردن بە شتی هیچ‌وپووچەوە.
(٢) سکاڵاکردن لە شتی هیچ‌وپووچ؛ هەمیشە ڕەخنەی بێ جێ گرتن.
**nigh** (nī), ***adv.*** [Archaic or Dial.], (١) نزیك (کات، شوێن).
(٢) نزیکەی.
*adj.* [Archaic or Dial.], (١) نزیك. (٢) یەکسەر؛ قەدبڕ.
(٣) لە لای چەپ (ووڵاخ، ئوتومبیل). (٤) ڕەزیل‌و ناپەسەند.
*prep.* [Archaic or Dial.], نزیك.
*v.i. & v.t.* لێ نزیکبوونەوە.
**night** (nīt), *n.* (١) شەو؛ شەوگار. (٢) تاریکی. (٣) (ا) تاریکی (مەجاز)؛ کاتی نەزانی‌و ڕێی ڕاست وون کردن؛ کاتی دژوارو ناخۆشی.
(ب) کاتی خەم. (ج) مردن.
*adj.* شەو؛ بۆ شەو؛ هی شەو.
**make a night of it,** بە ئاهەنگ شەو بردنەسەر.
**night and day,** شەوو ڕۆژ؛ هەمیشە.
**night blindness,** شەوکوێری.
**nightcap** (nīt′kap′), *n.* (١) کڵاوی نووستن؛ تەپڵەی ناوجێگە.
(٢) [Colloq.]، پێکی خواردنەوەی کحولی‌یە لەپێش نووستندا دەخورێتەوە.
**night clothes,** جلی شەو؛ جلی نووستن (وەك بیجامە).
**night club,** یانەی شەو؛ سەماخانە؛ تیاترۆ.
**night-dress** (nīt′dres′), *n.* (١) کراسی نووستنی ژنانە؛ شەوکراسی ئافرەت. (٢) **night clothes** .
**nightfall** (nīt′fôl′), *n.* شەو داهاتن؛ تاریك داهاتن.
**nightgown** (nīt′goun′), *n.* (١) کراسی نووستنی ژن؛ شەوکراسی ئافرەت‌و منداڵ. (٢) کراسی نووستنی پیاوانە.
**nighthawk** (nīt′hôk′), *n.* (١) هەڵۆی شەو. (٢) کەسێکی شەوەکی؛ کەسێکە کە تا درەنگ ئیش دەکات یا دادەنیشێ.
**night heron,** شاهۆی شەو: شاهۆیەکە بە شەوو تاریك‌و لێڵی دەگەڕێ.
**nightingale** (nīt′'n-gāl′, nīt′iŋ-gāl′), *n.* بلبل؛ بولبول.
**night letter,** برووسکەی شەو: برووسکەیەکە بە شەو دەنێررێ‌و ڕۆژی دوایی دەگەیەنرێ لە هی ڕۆژ هەرزانترە.
**night light,** چرای شەو: گلۆپێکی کزە بە درێژایی شەو لە ڕاڕەوی ماڵدا دەسووتێ.
**nightlong** (nīt′lôŋ′), *adj.* هەموو شەو بەردەوامە.
*adv.* بە درێژایی شەو.
**nightly** (nīt′li), *adj.* (١) شەوی؛ هی شەوی.
(٢) شەوانە؛ هەموو شەوێك ڕوودەدات: *( ~ performances)* .
*adv.* (١) لە شەودا؛ هی شەو. (٢) هەموو شەوێك.
**nightmare** (nīt′mâr′), *n.* (١) مێردەزمە؛ دێوەزمە؛ مۆتەکە.
(٢) بەسەرهاتێکی زۆر ناخۆش.
**nightmarish** (nīt′mâr′ish), *adj.* مێردەزمەیی؛ دێوەزمەیی:
*( a ~ experience in jail)*
**night owl,** (١) کونەبەبووی شەو. (٢) کەسێکی شەوەکی؛ کەسێکە کە شەو تا درەنگ ئیش دەکات یا دادەنیشێ.
**nightrider** (nīt′rī′dẽr), *n.* ئەسپ سواری شەو: ئەندامی دەستەیەك ئەسپ سواری شەلاتی دەماخ کردووە کە بە شەو دەگەڕان‌و خەڵکیان بەچەترسێن دەکردو دەستدرێژی‌یان دەکرد (لە ناوچەکانی خوارووی ئەمەریکا).

**night robe,** = **nightgown.**
**nights** (nīts), *adv.* [Colloq.], به شەو *(He works ~.)*.
**night school,** قوتابخانەی شەو.
**nightshade** (nīt′shād´), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکی ژەهراوییە.
**nightshirt** (nīt′shûrt´), *n.* کراسی شەو کراسێکی پیاوانەی تا ئەژنۆیە بۆ نوستن
**night-spot** (nīt′spot´), *n.* [Colloq.], = **night club.**
**night stick,** داردەستی پۆلیس.
**night-tide** (nīt′tīd´), *n.* [Poetic], = **night-time.**
**night-time** (nīt′tīm´), *n.* شەو؛ شەوگار
**nightwalker** (nīt′wôk´ēr), *n.* (١) جۆرە کرمێکی ژێرزەمینە بە شەو دەگەڕێ (٢) شەوگەڕ (بۆ پیاوخراپی یا داوێن پیسی وەك دزو قەحبە).
**night watch,** (١) پاسەوانی شەو. (٢) پاسەوانی شەو؛ حەسحەس؛ قۆڵ؛ نۆبەچی شەو (٣) نۆبەتی پاسەوانی؛ شەفتی پاسەوانی.
**night watchman,** پاسەوانی شەو؛ حەسحەس؛ قۆڵ؛ نۆبەچی شەو.
**night-wear** (nīt′wâr´), *n.* جلی شەو.
**nighty** (nīt′i), *n.* [Colloq.], = **nightgown.**
**nigrescence** (nī-gres′'ns), *n.* (١) ڕەش بوون؛ ڕەش بوونەوە. (٢) ڕەشێتی بەتایبەتی هی پێست و قژو چاو؛ ڕەشی.
**-negrescent** *(adj.).*
**nigrify** (nig′rə-fī´), *v.t.* ڕەش کردن؛ ڕەش کردنەوە.
**nigritude** (nig′rə-to͞od´, nig′rə-tūd´), *n.* (١) ڕەشێتی؛ ڕەشی (٢) شتێکی ڕەش.
**nihil** (nī′hil), *n.* (١) هیچ؛ هیچ شتێك. (٢) شتێکی هیچ و پووچ؛ شتێکی بێ بایەخ.
**nihilism** (nī′ə-liz'm), *n.* (١) فەلسەفەیەکە دەڵێت: کە هیچ شتێك بوونی نییەو نازانرێ و ناگەیەنرێ بە کەسی تر. (٢) فەلسەفەیەکە بڕوای نییە بە هیچ جۆرە فەلسەفەو بیروباوەڕێکی ڕەووشت چاکی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و دژیان دەوەستێ (٣) نەهێلان: بیروباوەڕێکە دەڵێت: کە نەبێ هەموو دەزگا ڕامیاری و کۆمەڵایەتییەکان بڕووخێنرێن و دەزگای تازە لە جێگەیان دابمەزرێ؛ بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی خوێناوی. (٤) [N-]: بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕی خوێناوی بوو لە دوادوای سەدەی (١٩)و سەرەتای سەدەی (٢٠) لە ڕوسیا.
**-nihilist** *(n.)*; **nihilistic** *(adj.).*
**nihility** (nī-hil′ə-ti), *n.* نەبوون؛ هیچێتی؛ هیچی
**nil** (nil), *n.* هیچ؛ سفر *(The profits were ~.)*.
**nill** (nil), *v.t. & v.i.* [Archaic], نەویستن *(will I ~ I.)*.
**nimble** (nim′b'l), *adj.* (١) زرنگ؛ زیرەك؛ وریا؛ تیژ (مێشك) *(a ~ mind)* (٢) گورج وگۆڵ؛ چابك؛ سووکەڵە (بزووتن)؛ چوست وچالاك؛ خێرا.
**-nimbly** *(adv.).*
**nimbo-stratus** (nim´bō-strā′təs), *n.* هەورێکی تانی نزمی باران و بەفراوی.
**nimbus** (nim′bəs), *n.* (١) تریفەی دەوری سەری خوداکان کاتی هاتنیان بۆ سەرزەمین (ئەفسانەی یۆنان و ڕۆمان). (٢) تریفەی دەوری سەری پیرو پیاوچاکان (خاچ پەرستی). (٣) تریفەی دەوری سەری مرۆڤێك یا شتێکی بیرۆز (٤) **nimbo-stratus**
**nimiety** (ni-mī′ə-ti), *n.* درێژەپێدان (وێژە، نووسراو)؛ زیادەڕۆیی.
**niminy-piminy** (nim′ə-ni-pim′ə-ni), *n.* خۆ تەسك کردنەوە (دووان)
**Nimrod** (nim′rod), *n.* (١) نیمروود ڕاوکەرێکی لێهاتووی وەچەی "نوح" بوو (ئینجیل). (٢) [n-]: ڕاوکەر؛ ڕاوچی.
**nincompoop** (nin′kəm-po͞op´), *n.* کەسێکی کەری هیچ نەزان؛ کەودەن
**nine** (nīn), *adj.* نۆ
*n.* (١) نۆ؛ ژمارە نۆ. (٢) دەستەیەکی نۆ کەسی (بەتایبەتی لە یاری بێسبۆڵدا)؛ دەستەیەکی نۆ دانەیی.
**ninefold** (nīn′fōld´), *adj.* (١) نۆ بەشە. (٢) نۆ ئەوەندە؛ نۆ قات.
*adv.* نۆ ئەوەندە؛ نۆ قات.
**ninepence** (nīn′pəns), *n.* نۆ پەنس: دراوێکی ئینگلیزی نۆ پوولییە.
**nine-pins** (nīn′pinz´), *n.pl.* یارییەکە لە یاری "بۆلینگ" دەچێ.
**nineteen** (nīn′tēn′), *n.* نۆزدە.
**nineteenth** (nīn′tēnth′), *adj.* (١) نۆزدەهەم. (٢) نۆزدەیەك.
*n.* (١) نۆزدەهەم. (٢) نۆزدەیەك.
**ninetieth** (nīn′ti-ith), *adj. & n.* (١) نەوەدەهەم. (٢) نەوەدیەك.
**ninety** (nīn′ti), *adj.* نەوەد.
*n.* نەوەد.
**the nineties,** نەوەدەکان (لە سەدەیەکدا یا لە ژیانی کەسێکدا).
**ninth** (nīnth), *adj. & n.* (١) نۆهەم؛ نۆیەم. (٢) نۆیەك.
**nip** (nip), *v.t.* (١) گوشین؛ چڕنووك لێگرتن؛ گازلێگرتن؛ کرۆشتن. (٢) بڕینەوە (خەڵف)؛ بڕین (باخ)؛ قەڵەم کردن؛ قرتاندن؛ لێکردنەوە. (٣) بەربەست کردن؛ پێشێل کردن. (٤) زیان لێدان (سەرما وسۆڵە، زوقم)؛ فەوتاندن؛ چووزاندنەوە: *(Frost ~ped the plants.)* (٥) [Slang]، (ا) قۆزینەوە؛ قۆستنەوە؛ پڕپیاکردن؛ ڕفاندن؛ هەڵپڕووسکان. (ب) دزین.
*v.i.* (١) گازلێگرتن؛ چڕنووك لێگرتن؛ ووشین. (٢) [British Colloq.]، خێرا بۆ دەرچوون؛ بە چوست و چالاکی جووڵانەوە؛ بە گورج وگۆڵی جووڵانەوە.
*n.* (١) گاز؛ چڕنووك. (٢) قەپ؛ قەپاڵ؛ قەپی بچووك. (٣) تیژی؛ بڕندەیی؛ چووزانەوەیی. (٤) سەرما وسۆڵە؛ زوقم. (٥) توانجی تیژ؛ ووتەی بڕندە؛ قسەی توندوتیژ. (٦) تیژی پەنیر.
**nip and tuck,** دووبەختی (ملەملێ)؛ بەرامبەر (پێشبڕکێ).
**nip in the bud,** پێشێل کردن لەسەرەتاوە پێش پشکووتن؛ چارەکردن پێش سەردەرهێنان و پەرەسەندن؛ بە ساوایی لەناوبردن: *(The plot was nipped in the bud.)*
**nip** (nip), *n.* قوم (خواردنەوەی کحول).
*v.t. & v.i.* قوم لێدان (خواردنەوەی کحول).
**nipper** (nip′ēr), *n.* (١) مەنگەنە؛ گیرە. (٢) (*pl.*) پلایس؛ گاز (ئامێر). (٣) ئەندامی بڕندە یا گازو چڕنووك گرتن: (ا) ددانی بڕندە یا پێشەوەی ئەسپ. (ب) چنگی قرژاڵ. (٤) [British Colloq.]؛ منداڵ. (٥) [Slang]، (ا) کەلەپچە. (ب) پێوەند.
**nipping** (nip′iŋ), *adj.* (١) تیژ؛ توندوتیژ؛ بڕ (ساردو سەرما، توانج)؛ زۆر سارد. (٢) تەوس؛ بەتەوسەوە.
**nipple** (nip′'l), *n.* (١) گۆی مەمك؛ سەرگۆی مەمك. (٢) گۆی مەمکەشووشە. (٣) گۆ (سەری سۆندەو بۆری... هتد)
**nippy** (nip′i), *adj.* (١) زۆر سارد؛ تیژ *(The air is ~.)*. (٢) [British Colloq.]، چوست و چالاك؛ چابك؛ سووکەڵە؛ گورج وگۆڵ.
**nirvana** (nēr-van′ə, nir-vä′nə), *n.* نیرڤانە: (ا) خۆشی و شادی پاش مردن و نەمانی ئادەمیزاد (ئاینی بوودی و هیندی). (ب) خۆشی و شادمانییەکە بە لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنان و نەهێشتنی هەموو جۆرە حەزوئارەزوویەك مرۆڤ دەیگاتێ.
**nit** (nit), *n.* (١) ڕشك. (٢) گەرای ڕشك.
**nit-picking** (nit-pik′iŋ), *n.* [Colloq.], ڕەخنەی هیچ وپووچ گرتن.
**niter, nitre** (nī′tēr), *n.* نیترات.
**nitrate** (nī′trāt, nī′trit), *n.* نیترات.
**nitric acid,** تێزاب.
**nitrify** (nī′trə-fī´), *v.t.* (١) نیترۆجین تێکردن. (٢) نیترات تێکردن (خاك).
**nitro-** (nī′trō, nī′trə), پێشگرێکە بەمانای: (١) نیترات. (٢) نیترۆجین.
**nitrogen** (nī′trə-jən), *n.* نیترۆجین.



**O, o** (ō), *n.* (١) تیپی پانزەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە (٣) قالبی ئەم تیپە (٤) سفر
(٥) شتێك لە شێوەی ئەم تیپەدا. (٦) نیشانەی پلەی پانزەهەم.
*adj.* (١) تایبەتی ئەم تیپە (٢) خڕ؛ هێلکەیی (٣) پانزەهەم؛ پلەی پانزەهەم
**O** (ō), *interj.* نیشانەیەکی سەرسامییە بە گەلێك مانا و شێوە
بەکاردەهێنرێت. (١) بۆ بانگ کردن یا هاوار بۆ هێنان: ***( ~ God, save us!)*** .
(٢) بۆ دەربڕینی سەرسامی و ترس و ئازار (وەك: ئەی!، ئای!، ئۆه!).
(ئێستا بە " oh " دەنووسرێت).
**oaf** (ōf), *n.* (١) منداڵێکی ناتەواوی ئالوگۆڕکراو بە منداڵێکی ئاسایی یا
تەواو (٢) منداڵێکی شێواو و ناتەواو یا گێل.
(٣) کەسێکی جلفڕ یا دەبەنگ؛ کەسێکی کەر و بێ مێشك.
**oafish** (ōf′ish), *adj.* جلفڕ؛ گێل؛ کەودەن؛ بێ مێشك
**oak** (ōk), *n.* (١) داربەڕوو؛ بەڕوو (٢) تەختەدار و داری بەڕوو
(٣) هەر جۆرە ڕووەکێکی وەك بەڕوو (٤) گوڵبەندی گەڵای بەڕوو.
(٥) کەرەسەی ناوماڵ و شتی تری لە داربەڕوو دروستکراو.
*adj.* هی تەختەداری بەڕوو؛ هی داربەڕوو؛ لە داربەڕوو دروستکراو؛ بەڕوو
**oak apple, oak gall,** مازوو
**oaken** (ōk′ən), *adj.* لە تەختەداری بەڕوو دروستکراو؛ بەڕوو
**oakum** (ō′kəm), *n.* پرزۆڵەی گوشی کۆنە (قیری لێ دەدرێ و درزی
بەلەم و کەشتی پێ دەگیرێ)
**oar** (ôr, ōr), *n.* (١) سەوڵ؛ دارە سەوڵ. (٢) سەوڵ لێدەر
*v.t. & v.i.* سەوڵ لێدان.
**put one's oar in,** دەست خستنە ئیش و کاری خەڵکەوە؛
پەنجە تێوەردانی کاری خەڵك
**rest on one's oars,** پشوودان؛ پشوو وەرگرتن
**oarfish** (ôr′fish′, ōr′fish′), *n.* سەوڵەماسی؛ ماسییەکی دەریایی
گەورەی پەڕدکە درێژە
**oarlock** (ôr′lok′, ōr′lok′), *n.* قفڵی سەوڵ لەشێوەی " U " دایە بۆ
ڕاگیرکردنی سەوڵ لە جێی خۆیدا لەکاتی سەوڵ لێداندا؛ گیرەی سەوڵ.
**oarsman** (ôrz′mən, ōrz′mən), *n.* سەوڵ لێدەر
**oarsmanship** (ôrz′mən-ship′, ōrz′mən-ship′), *n.* هونەری
سەوڵ لێدان؛ سەوڵ لێدان.
**oasis** (ō-ā′sis, ō′ə-sis), *n.* (١) مێرگ (بەتایبەتی لە بیاباندا).
(٢) پەناگا؛ جێی حەوانەوە
**oat** (ōt), *n.* چەند جۆرە دانەوێڵەیەکە لە جۆ دەچێ بۆ ئالیك
بەکاردەهێنرێت و هەندێ جۆریشی ئادەمیزاد دەیخوات.
**feel one's oats,** (١) کەیف قنج بوون؛ بە دەماخ بوون؛ سرك بوون.
(٢) خۆ بە زل زانین؛ ترزل نوواندن.
**sow one's wild oats,** بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن و زۆر ڕابواردن لەکاتی
لاویدا.
**oaten** (ōt′'n), *adj.* لە دانەوێڵەی " oat " دروستکراوە کە لە جۆ دەچێ.
**oath** (ōth), *n.* (١) سوێند؛ سوێنگ؛ سوێن. (٢) سوێندخواردن.
(٣) پەیمان. (٤) کفر؛ لەعنەت.
**take an oath,** سوێندخواردن؛ سوێنددران.
**under oath.** بە سوێندخواردنەوە؛ بە سوێندەوە؛
بە سوێنگەوە بەستراوەتەوە: ***( He testified under oath.)*** .
**oatmeal** (ōt′mēl′), *n.* (١) دانەوێڵەی " oat " بە ووردکراوی یا
هاڕپراوی؛ ئارد و ووردەی ئەم دانەوێڵەیە. (٢) شۆربا یا هەریسەی ئەم دانەوێڵەیە.
**ob-** (ob, əb, ōb), پێشگرێکە بەمانای: (١) بەرەو. (٢) دژ؛ دژ بە.
(٣) لەسەر. (٤) بەتەواوی (٥) بە هەڵگەڕاوەیی.
**obduracy** (ob′doo-rə-si, ob′dyoo-rə-si), *n.* (١) دڵڕەقی.
(٢) ناپەشیمانی. (٣) کەللەڕەقی؛ قیرسیچمەیی؛ سەرسەختی.
**obdurate** (ob′doo-rit, ob′dyoo-rit), *adj.* (١) دڵڕەق.
(٢) ناپەشیمان.
(٣) کەللەڕەق؛ قیرسیچمە؛ سەرسەخت.
**obedience** (ō-bē′di-əns, ə-bē′di-əns), *n.* (١) بە گوێ کردن؛
گوێ ڕایەڵی؛ بەقسەکردن؛ ملدان؛ ملکەچی.
(٢) دەسەڵاتی کڵێسە.
(٣) کۆمەڵگایەك کە لە سنووری ئەم دەسەڵاتەدا بێت.
**obedient** (ō-bē′di-ənt, ə-bē′di-ənt), *adj.* گوێ ڕایەڵ؛ ملکەچ؛
بە گوێکەر؛ مل شۆڕ؛ گوێ ڕاگر.
**obeisance** (ō-bā′s'ns, ō-bē′s'ns), *n.* (١) کڕنووش؛
کڕنووش بردن. (٢) ڕێز؛ ڕێزگرتن؛ ملدان: ***( They did ~ to him.)***
-obeisant *(adj.).*
**obelisk** (ob′'l-isk′), *n.* (١) میل؛ پایەی بەردینی چوارگۆشەی سەر
قووچکەیی (گەلێك جار نووسینی بزماری لەسەرە). (٢) **obelus** .
**obelus** (ob′'l-əs), *n.* (١) نیشانەی " – " یا " ÷ " کە لە دەستنووسە
کۆنەکاندا بەکاردەهێنرا بۆ پیشاندانی ئەو بەند و بەشانەی کە گومانی لێ بکرێ.
(٢) نیشانەی خەنجەر کە دەخرێتە پاڵ ووشەیەك کە لە پەراوێزدا ڕوون
کرابێتەوە.
**obese** (ō-bēs′), *n.* زۆر قەڵەو.
**obesity** (ō-bēs′ə-ti, ō-bes′ə-ti), *n.* زۆر قەڵەوی؛
قەڵەوی لە ڕادە بەدەر.
**obey** (ō-bā′, ə-bā′), *v.t. & v.i.* پەیڕەوکردن؛ بە گوێ کردن؛ ملدان؛
بەقسەکردن؛ ملکەچ کردن: ***( Soldiers must ~ orders.)***
**obfuscate** (ob-fus′kāt, ob′fəs-kāt′), *v.t.* (١) تاریك کردن؛
لێڵ کردن؛ داپۆشین؛ شاردنەوە: ***( The fog ~d the shore.)***
(٢) لێڵ کردن؛ شێواندن؛ تێکدان؛ سەر لێ تێکدان:
***( His emotions ~d his judgement.)***
-obfuscation *(n.).*
**obit** (ō′bit, ob′it), *n.* = **obituary.**
**obiter dictum** (ob′i-tēr dik′təm), *n.* (١) ڕای لاسەرلا یا
ڕێکەوتی دادپرس کە هیچ پەیوەندی نەبێ بەو داوایەی لەبەردەمیایەتی
(٢) تێبینییەکی بێ بیرکردنەوە یا ڕێکەوتی.
**obituary** (ō-bich′ōō-er′i, ə-bich′ōō-er′i), *n.* یادکردنەوەی
مردوو لە ڕۆژنامەدا؛ هەواڵی مردنی کەسێك لەگەڵ کورتەی ژیاننامەکەیدا لە
ڕۆژنامەدا.
*adj.* هی هەواڵی مردنی کەسێك و یادکردنەوەی لە ڕۆژنامەدا: ***( ~ notices)*** .
**object** (ob′jikt), *n.* (١) شت؛ شتی هەستپێکراو.
(٢) کەسێك یا شتێك کە جێی گاڵتەپێکردن، خۆشەویستی، ڕق یا جۆرە

هەستێکی تر بێ *( to be an ~ of ridicule, contempt, love, etc.)* .
(٢) ئامانج؛ مەبەست: *( What is the ~ of the game?)* .
(٤) شتێك کە مێشك وەری بگرێ یا هەستی پێ بکات.
(٥) کارلێکراو (ڕێزمان)؛ تەواوکەر (ڕێزمان).
**object** (əb-jekt′, ob-jekt′), *v.i. & v.t.* (١) دژ وەستان؛ بەربەرەکانی کردن؛ بەرپەرچدانەوە؛ تەگەرەلێدان:
*( He ~ed to the testimony of the witness.)*
(٢) پەسەند نەکردن؛ ناڕەزایی دەربڕین:
*( He ~s to modern materialism.; I ~ to the noise.)*
(٣) دەست هێنانە ڕێ؛ تەگەرەلێدان؛ پەلپ گرتن؛ بەرهەڵستی کردن.
**objectify** (əb-jek′tə-fī´, ob-jek′tə-fī´), *v.t.* شێوەی تەندار پێدان؛ بەرگ کردنەبەر؛ پیشاندان نەك وەك شتێکی ڕووت بەڵکو وەك شتێکی هەستپێکراو و لەبەرچاو.
**objection** (əb-jek′shən, ob-jek′shən), *n.* (١) پەسەند نەکردن؛ دژ وەستان؛ بەرهەڵستی کردن. (٢) ڕەخنە؛ پەلپ؛ تەگەرە؛ ناڕەزایی.
(٣) هۆی پەسەند نەکردن؛ هۆی دژ وەستان.
**objectionable** (əb-jek′shən-ə-b'l), *adj.* ناپەسەند؛ بەد؛ خراپ؛ نابەجێ؛ ناشرین (کردەوە، ووتە، ڕەووشت)؛ جێی ڕەخنەیە:
*( an ~ smell, person, act, word, etc.)*
-objectionably *(adv.)*.
**objective** (əb-jek′tiv, ob-jek′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە شتێکی هەستپێکراو نەك بە شتێکی ڕووتی ناو مێشك؛ تەندار.
(٢) بێ لایەن: لەسەر شتەکە خۆی بەندە نەك هەستی کەسێتی خۆ:
*( an ~ person, description, analysis, etc.)*
(٣) تایبەتی بە باری کارلێکراو (ڕێزمان): **( me, him, her, them)** .
*n.* (١) شتێکی هەستپێکراوی لەبەرچاو؛ شتێکی تەندار.
(٢) مەبەست؛ ئامانج. (٣) (ا) باری کارلێکراو (ڕێزمان).
(ب) ووشەیەك کە لەم بارەدا بێت: **( me, him, her, them)** .
**objectively** (əb-jek′tiv-li, ob-jek′tiv-li), *adv.* بە بێ لایەنانە؛ بە بێ لایەنی *( to report the news ~ )* .
**objectivism** (əb-jek′tiv-iz'm, ob-jek′tiv-iz'm), *n.* (١) بیرو باوەڕی ماددی. بیروباوەڕێکی فەلسەفی‌یە کە دەڵێت: ڕاستی ئەوەیە کە هەستی پێ بکرێ‌و لەبەرچاو بێت نەك تەنها بیروباوەڕێك بێ لە مێشکدا.
(٢) بایەخ دان بە باسی هەستپێکراو نەك هەستی خۆ لە وێژەدا.
**objectivity** (ob´jek-tiv′ə-ti), *n.* (١) بێ لایەنی؛ بێ لایەنێتی
*( His report lacks ~ .)*
(٢) ڕاستی هەستپێکراو نەك هی ڕووت‌و تەنها لە مێشکدا.
**objectless** (ob′jikt-lis), *adj.* بێ ئامانج؛ بێ مەبەست.
**object lesson,** پەند ڕوونکردنەوە لەڕێی شتی لەبەرچاو و هەستپێکراوەوە.
**objurgate** (ob′jẽr-gāt´, əb-jũr′gāt), *v.t.* بە توندی سەرزەنشت کردن؛ شکاندن
**oblanceolate** (ob-lan′si-ə-lit, ob-lan′si-ə-lāt´), *adj.* لە ڕم دەچێ: بنەکەی باریك‌و پۆپەکەی پانە (گەڵا): *( an ~ leaf)* .
**oblate** (ob′lāt, ob-lāt′), *adj.* (١) خۆبەختکەر بۆ خودا.
(٢) هەردوو سەرەکەی پان یا تەختە (ئەندازە).
*n.* سۆفیلکە؛ خواپەرست.
**oblation** (ob-lā′shən, əb-lā′shən), *n.* (١) قوربانی دان (بۆ خودا)؛ قوربانی کردن. (٢) قوربانی.
**obligate** (ob′lə-gāt´), *v.t.* (١) بەستنەوە بە بەڵێن، قۆنتەرات، یا پەیمانەوە؛ ناچارکردن. (٢) منەتبارکردن؛ چاوبەرەوژێرکردن.
*adj.* (١) بەستراوە (بە بەڵێن. پەیمان، یا قۆنتەراتێکەوە)؛ ناچار.
(٢) بە بارێکی ژیانەوە بەستراوەتەوە.
**obligation** (ob´lə-gā′shən), *n.* (١) بەستنەوە بە بەڵێن یا پەیمانەوە؛ بەسترانەوە بە بەڵێنەوە. (٢) پێویستی سەرشان:
*( a person's ~ to his family, friends and country)*
(٣) پەیمان؛ بەڵێن.
(٤) (ا) منەتباری (ب) منەت.
**obligatory** (ə-blig′ə-tôr´i, ob′li-gə-tō´ri), *adj.* پێویست؛ پێویستی سەرشانە؛ زۆرەکی *( Attendance at school is ~ .)*
**oblige** (ə-blīj′, ō-blīj′), *v.t.* (١) زۆرلێکردن؛ ناچارکردن؛ بەگیرهێنان؛ بە زۆر پێ کردن. (٢) چاوبەرەوژێرکردن؛ منەتبارکردن.
-obliger *(n.)*.
**obligee** (ob´li-jē′), *n.* (١) ناچارکراو؛ بە زۆر پێ کراو؛ بەگیرهێنراو.
(٢) چاوبەرەوژێرکراو؛ منەتبارکراو.
(٣) کەسێکی بەستراوە بە قۆنتەرات یا پەیمانەوە.
**obliging** (ə-blīj′iŋ, ō-blīj′iŋ), *adj.* (١) [Rare]، زۆرەکی.
(٢) چاکەکەر؛ هەمیشە ئامادەی یارمەتیدانی خەڵکە؛ دەست‌ودڵ فراوان.
**obligor** (ob´li-gôr′, ob′li-gôr´), *n.* بەڵێندەر؛ پەیماندەر؛ خۆبەستەرەوە بە پەیمانەوە یا بە قۆنتەراتەوە.
**oblique** (ə-blēk′), *adj.* (١) لار؛ خوار؛ ناڕێك؛ لابەلا.
(٢) ناڕاستەوخۆ؛ ناڕێك.
(٣) چەوت؛ سەر چەوت؛ پشت پێ نەبەستراو.
(٤) هی ماسولکەی خوار.
(٥) لاکانی ناهاوتان (گەڵا). (٦) ناڕاستەوخۆ (دووان).
*v.i.* (١) خواربوونەوە؛ لاربوونەوە.
(٢) بە خواری ڕۆیشتن؛ لادان لە ڕێ بە " ٤٥ " پلە.
**oblique angle,** گۆشەی لار (کە گۆشەی تیژو کراوە دەگرێتەوە).
**obliquity** (ə-blik′wə-ti), *n.* (١) (ا) لاری؛ خواری؛ ناڕێکی.
(ب) پلەی ئەم لارییە.
(٢) چەوتی (ڕەووشت)؛ لە ڕێی ڕاست لادان؛ بەدڕەفتاری.
(٣) ناڕاستەوخۆیی‌و لێڵی (دووان، نووسین، بیرکردنەوە).
(٤) (ا) خواری هێڵ یا ڕوویەك (ژمارەوپێوان).
(ب) پلەی ئەم خوارییە.
**obliterate** (ə-blit′ə-rāt´), *v.t.* (١) سڕینەوە (نووسین، نیشانە)؛ کوژاندنەوە. (٢) لەناوبردن؛ نەهێشتن؛ لابردن؛ کوێرکردنەوە (یاد)؛ ڕیشەکێش کردن:
*( to ~ a nation, a memory, differences between two or more things, etc.)*
-obliteration *(n.)*; obliterative *(adj.)*; obliterator *(n.)*.
**oblivion** (ə-bliv′i-ən), *n.* (١) فەرامۆش کران؛ خرانە پشت گوێ؛ لە بیری خەڵك چوونەوە: *( to fall into ~ )* .
(٢) لەبیرچوونەوە؛ لەبیر نەمان؛ فەرامۆش کردن: *( to suffer form ~ )*
(٣) بەخشین؛ لێ خۆشبوون؛ چاو لێ نووقاندن (تاوان).
**oblivious** (ə-bliv′i-əs), *adj.* (١) بێ بیر؛ شت لەبیرچوو؛ بیر خراپ.
(٢) بێ ئاگا؛ لەبیرچووەوە؛ گوێ پێ نەدەر؛ فەرامۆشکەر:
*( to be ~ of one's surroundings; ~ to the danger)*
**oblong** (ob′lôŋ), *adj.* لاکێشە؛ لاکێش؛ درێژکۆلە.
*n.* لاکێشە؛ ڕوویەك یا وێنەیەکی لاکێش.
**obloquy** (ob′lə-kwi), *n.* (١) بەدگۆیی؛ ڕەخنەی توندوتیژ؛ جنێو؛ سەرزەنشت. (٢) ناوزڕان‌و شەرمەزاری‌و ڕووڕەشی (لە ئەنجامی بەدگۆیی خەڵکدا).
**obnoxious** (əb-nok′shəs), *adj.* (١) زۆر ناپەسەند؛ بەد (ڕەووشت، مرۆڤ، کردار)؛ پەستکەر؛ بێزارکەر: *( an ~ person)* .
(٢) [Archaic]، بۆی هەیە زیانی پێ بگات.
(٣) [Archaic]، بافتی سزادانە؛ شایستەی سەرزەنشتی‌یە.
-obnoxiously *(adv.)*; obnoxiousness *(n.)*.
**oboe** (ō′bō, ō′boi), *n.* زوڕنا؛ کەڕەنا.
**obovate** (ob-ō′vāt), *adj.* هێلکەیی هەڵگەڕاوە (گەڵای بن باریك).
**obscene** (ob-sēn′, əb-sēn′), *adj.* (١) هەڵماڵراو؛ بێ شەرم؛ سووك؛

مەوەس هەڵسێنەر؛ بەرەڵا: *( ~ pictures)* .
(٢) ناشرین (قسە، کردەوە)؛ پیس؛ ناپەسەند.

**-obscenely** *(adv.)*.

**obscenity** (ob-sen′ə-ti, əb-sē′nə-ti), ***n.*** (١) هەڵماڵراوی؛ پیسی؛
بێ شەرمی؛ بەرەڵایی؛ ناپەسەندی (ڕوخسار، ڕوو، ڕەووشت، ووتە).
(٢) شتێکی پیس و ناپەسەند (ووتە، کردەوە، ڕەووشت).

**obscurant** (əb-skyoor′ənt, ob-skyoor′ənt), ***n.*** کەسێکی دژ
بە پێشکەوتن و ڕۆشنبیری؛ کۆسپی ڕێی زانیاری و پێشکەوتن؛ تاریک پەرست.
***adj.*** تایبەتی بە کەسانی دژ بە پێشکەوتن و ڕۆشنبیری.

**obscurantism** (əb-skyoor′ən-tiz′m), ***n.*** (١) دژایەتی
پێشکەوتن و ڕۆشنبیری؛ ڕێ گرتن لە چاوکردنەوە و پێشکەوتنی گەل؛
تاریکی پەرستی. (٢) (ا) لێڵی دەسەنقەست (وێژە، هونەر).
(ب) نموونەیەکی ئەم لێڵی و ناڕوونی‌یە دەسەنقەستە

**obscure** (əb-skyoor′, ob-skyoor′), ***adj.*** (١) تاریك؛ نەدیار:
*( an ~ corner of the room)*
(٢) (ا) ناڕوون؛ کز؛ لێڵ؛ نادیار: *( an ~ figure or sound)* .
(ب) لێڵ؛ شاراوە؛ ناڕوون؛ نادیار *( an ~ explanation, point, etc.)* .
(٣) (ا) نەناسراو؛ شاراوە؛ بێ ناو: *( an ~ scientist)* .
(ب) نەناسراو؛ دوور؛ شاراوە؛ تەریك؛ ناگرنگ:
*( an ~ town, country,etc.)*
***v.t.*** (١) تاریك کردن
(٢) داپۆشین؛ شاردنەوە؛ بەرگرتن: *( The moon was ~d by clouds.)* .
(٣) لێڵ کردن؛ شاردنەوە؛ داپۆشین:
*( to ~ an issue, a grievance, a fact, etc.)*
(٤) کەمکردنەوە یا شاردنەوەی دەنگی تیپە بزوێن (دەنگناسی).

**-obscurely** *(adv.)*; obscureness *(n.)*.

**obscurity** (əb-skyoor′ə-ti, ob-skyoor′ə-ti), ***n.*** (١) تاریکی؛
لێڵی؛ نادیاری؛ ناڕوونی. (٢) نەناسراوی؛ بێ ناوی؛ شاراوەیی:
*( He is content to live in ~ .)*
(٣) کەسێك یا شتێکی نەناسراو، بێ ناو، یا شاراوە.

**obsecrate** (ob′si-krāt′), *v.t.* [Rare], لێ پاڕانەوە

**obsequious** (əb-sē′kwi-əs, ob-sē′kwi-əs), ***adj.*** (١) حەز بە
نۆکەری کەر؛ کلکەلەقێکەر؛ مەرایکەر. (٢) [Rare]، دڵسۆز؛ ملکەچ؛ گوێ ڕایەڵ.

**-obsequiously** *(adv.)*; obsequiousness *(n.)*.

**obsequy** (ob′si-kwi), *n.* ( *pl.* obsequies), پرسە (ئەم ووشەیە
بەزۆری لە شێوەی کۆدا بەکاردەهێنرێت).

**observable** (əb-zûr′və-b'l, ob-zûr′və-b'l), ***adj.*** (١) بینراو؛
دەبینرێ؛ دیار؛ لەبەرچاو: *( ~ improvements)* .
(٢) سەرنج ڕاکێش؛ گرنگ؛ شایانی باس
(٣) یادی دەکرێتەوە: *( an ~ religious holiday)*

**observance** (əb-zûr′vəns, ob-zûr′vəns), ***n.*** (١) پەیڕەوی کردن
(یاسا، نەریت، ئەرکی سەرشان). (٢) نەریت (کۆمەلایەتی، ئاینی... هتد).
(٣) یادکردنەوە *( the ~ of his birthday)*
(٤) تێبینی؛ سەرنجدان؛ سەرنج
(٥) (ا) پەیڕەوی‌یەکانی دەستەی ئاینی (ئاینی کاسۆلیکی).
(ب) دەستەیەکی ئاینی وەها.
(٦) [Archaic]، ڕێزگرتن؛ ڕێز؛ دڵ ڕاگرتن

**observant** (əb-zûr′vənt, ob-zûr′vənt), ***adj.*** (١) بە ووردی
پەیڕەویکەر *( ~ of the rules of etiquette)*
(٢) وورد؛ هۆشیار؛ بەئاگا؛ سەیرکەر
(٣) بە سەرنج؛ ووردبین؛ تێبین: *( an ~ child)*

**observation** (ob′zēr-vā′shən), ***n.*** (١) پەیڕەوی کردن (یاسا،
نەریت... هتد). (٢) (ا) سەرنج؛ سەرنج پێدان؛ بینین؛ تەماشاکردن.
(ب) شتێکی سەرنج پێدراو یا بینراو
(٣) بینران *( Let's try to avoid ~ .)*
(٤) تێبینی؛ تێبینی کردن و تۆمارکردن.
(٥) چاودێری کردن (نەخۆش، گومانبار، تاوانبار):
*( to keep a patient or a suspect under ~ )*

-observational *(adj.)*.

**observation car,** فارگۆنی تەماشا: فارگۆنێکی پڕ لە پەنجەرەیە
لە بەشی دواوەی شەمەندەفەردا بۆ دیمەن سەیرکردن.

**observation post,** بنکەی چاودێری (سوپا)؛ قوللەی چاودێری؛
ڕووانگە.

**observatory** (əb-zûr′və-tôr′i, ob-zûr′və-tō′ri), ***n.*** ڕووانگە.

**observe** (əb-zûrv′, ob-zûrv′), ***v.t.*** (١) پەیڕەوی کردن؛
لەسەر ڕۆیشتن: *( to ~ the rules and regulations)* .
(٢) یادکردنەوە: *( Do you ~ Christmas?)*
(٣) بینین؛ هاتنە بەرچاو؛ چاوپێکەوتن.
(٤) سەرنج پێدان؛ تێبینین. (٥) ووتن؛ بێژان (٦) لێکۆڵینەوە.
***v.i.*** (١) چاوپێکەوتن؛ بینین. (٢) ووتن؛ تێبینین؛ لێ دووان.
(٣) چاودێری کردن.

**observer** (əb-zûr′vēr, ob-zûr′vēr), ***n.*** (١) چاودێر؛ چاودێریکەر.
(٢) چاودێر: نوێنەرێك کە چاودێری کاروباری کۆنفرانسێك دەکات بەبێ مافی
دەنگدان. (٣) (ا) سەربازی چاودێر لە فڕۆکەی سوپادا.
(ب) سەربازی بنکە یا قوللەی چاودێری.

**obsess** (əb-ses′, ob-ses′), ***v.t.*** بوون بە خولیا؛ هەمیشە لە خەیاڵدا
بوون؛ سواری مێشك بوون؛ سەرقاڵ کردن؛ کەڵکەڵە پێ خستن:
*( to be ~ed by an idea; The thought he might lose his position ~ed him.)*

**obsession** (əb-sesh′ən, ob-sesh′ən), ***n.*** سەرقاڵی کەسێك بە
بیرێکەوە کە سواری سەری دەبێ و لە کۆڵی نابێتەوە؛ کەڵکەڵە پێ کەوتن؛
خولیا؛ ماخۆلیان.

**obsessive** (əb-ses′iv, ob-ses′iv), ***adj.*** (١) سەرقاڵکەر؛
کەڵکەڵەپێخەر (٢) لە ڕادە بەدەر.
(٣) خولیایی؛ تایبەتی بە کەڵکەڵە یا ماخۆلیان.

**obsidian** (əb-sid′i-ən, ob-sid′i-ən), ***n.*** بەردێکی شووشەیی
ڕەشی سەختی ئاگرپڕژێنی‌یە وەك " گرانیت " وایە.

**obsolescence** (ob′sə-les′'ns), ***n.*** کۆنی؛ کۆن بوون؛
بەکارنەهاتن لەبەر کۆنی.

**obsolescent** (ob′sə-les′'nt), ***adj.*** کۆن؛ بەکار نەهاتوو لەبەر کۆنی.

**obsolete** (ob′sə-lēt′), ***adj.*** (١) کۆن؛ مردوو (مەجاز)؛ بەکارنەهاتوو؛
بەکارنەهێنراو (لەبەر کۆنی): *( an ~ word)* .
(٢) کۆنباو؛ کۆن؛ کۆنە؛ بەکارنەماو؛ باونەماو: *( an ~ gun)* .
(٣) لە ئەماندایە یا بەرە بەرە بچووك دەبێتەوە بەهۆی بار گۆڕانەوە (ئەندامی
زیندەوەر).

**obstacle** (ob′sti-k'l), ***n.*** کۆسپ؛ کەندوکۆسپ؛ بەرهەڵست؛ تەگەرە؛
قۆرت؛ بەربەست.

**obstacle race,** پێشبڕکێی بەربەست (کە بریتی‌یە لە ڕاکردن و بازدان
بەسەر بەربەستی جۆراوجۆردا).

**obstetric** (ob-stet′rik, əb-stet′rik), ***n.*** تایبەتی بە مامانی؛
هی منداڵبوون.

**obstetrician** (ob′ste-trish′ən), ***n.*** پزیشکی منداڵبوون.

**obstetrics** (ob-stet′riks, əb-stet′riks), ***n.pl.*** پزیشکایەتی
منداڵبوون؛ پیشە و زانستی پزیشکایەتی منداڵبوون و مامانی.

**obstinacy** (ob′sti-nə-si), ***n.*** (١) کەللەڕەقی؛ سەرسەختی؛ مانگرتن؛
قیرسیچمەیی؛ خرسی؛ سەرکێشی. (٢) دەرمان کار لێ نەکردن؛ چاك نەبوونەوە
بە ئاسانی. (٣) کردەوەیەك یا هەڵوێستێکی کەللەڕەقانە.

**obstinate** (ob′sti-nit), ***adj.*** (١) کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ سەرکێش؛
مانگر؛ قیرسیچمە؛ خرس.
(٢) دەرمان کاری تێ ناکات؛ بە ئاسانی چاك نابێتەوە:

*( an ~ headache, fever, etc.)*
(۳) دابین نەکرێ؛ دابین نابێ بە ئاسانی؛ سەرکێش؛ ملنەدەر.

**obstreperous** (əb-strep′ēr-əs), *adj.* دابین نەکراو؛
ملنەدەر بە ئاشکراو هەرا هەرا کردنەوە؛ هەراوهوریاکەرو دژەستاو.

**obstruct** (əb-strukt′, ob-strukt′), *v.t.* (۱) ڕێ لێگرتن؛ داخستن
(ڕێ، بۆری، جۆگە)؛ بەربەستکردن؛ گرتن (ڕێ، پاڕەو، ئاوەڕۆ).
(۲) کۆسپ خستنەڕێ؛ قۆرت تێخستن؛ بەرهەڵستی کردن؛ تەگەرە تێخستن.
(۳) بەرگرتن (دیمەن)؛ بەردەم گرتن:
*( to ~ a view; You can't ~ the view.)*

**obstruction** (əb-struk′shən), *n.* (۱) ڕێ لێگرتن؛ دواخستن؛
کۆسپ خستنەڕێ؛ دواخران؛ بەربەستکردن؛ بەرهەڵستی کردن؛
تەگەرە تێخستن *( the ~ of justice)*.
(۲) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ؛ قۆرت.

**obstructionism** (əb-struk′shən-iz'm), *n.* ڕێ لێگرتن:
ڕێبازی تەگەرەلێدان و ڕێ لێگرتن (ووشەی داهاتوو ببینە).

**obstructionist** (əb-struk′shən-ist), *n.* ڕێ لێگر (بەتایبەتی
ئەندامێکی پەرلەمان کە هەمیشە تەگەرە دەخاتە ڕێی یاسای تازەوە و دەبێتە
کۆسپ لە ڕێی پێشکەوتندا)؛ کۆسپ؛ بەربەستکەر.

**obstructive** (əb-struk′tiv, ob-struk′tiv), *adj.* ڕێ لێگر:
کۆسپ خەرە بەردەم؛ تایبەتی بە بەرهەڵستی کردن یا ڕێ لێگرتن.

**obtain** (əb-tān′, ob-tān′), *v.t.* دەسکەوتن؛ چنگ کەوتن؛ پەیداکردن؛
پێگەیشتن؛ دەستگیربوون:
*( to ~ a visa, passport, what one wants, etc.)*
*v.i.* چەسپین؛ دامەزران؛ بڵاوبوونەوە؛ جێگیربوون؛ زاڵبوون:
*( Peace will ~ .)*

**obtainable** (əb-tān′ə-b'l, ob-tān′ə-b'l), *adj.* دەست دەکەوێ؛
دەستگیر دەبێ؛ پەیدا دەبێ.

**obtrude** (əb-trōōd′, ob-trōōd′), *v.t.* (۱) سەردەرهێنان؛
سەردەرپەڕاندن. (۲) خۆ سەپاندن بەسەردا؛ سەپاندن بەسەردا؛
تەنگ پێ هەڵچنین
*v.i.* خۆ سەپاندن بە سەردا.
-obtruder *(n.)*.

**obtrusion** (əb-trōō′zhən, ob-trōō′zhən), *n.* (۱) سەردەرهێنان؛
سەردەرپەڕاندن. (۲) سەری دەرپەڕیو؛ لووتکە. (۳) خۆ بەسەردا سەپێنەر.

**obtrusive** (əb-trōō′siv, ob-trōō′siv), *adj.* (۱) سەردەرپەڕیو؛
سەرهێنەرە دەرەوە *( an ~ rock on the side of the hill)*.
(۲) بێ شەرم و لەخۆبایی؛ چاوقایم؛ خۆ بەسەردا سەپێن:
*( the ~ behavior of a spoiled child)*
(۳) زۆر لەبەرچاو؛ زۆر بەدەرەوە؛ زۆر سەرنج ڕاکێش (لەڕووی خراپییەوە).
-obtrusively *(adv.)*; obtrusiveness *(n.)*.

**obtund** (ob-tund′, əb-tund′), *v.t.* مراندن (هەست)؛ سڕکردن؛
کەمکردنەوە (توندی).

**obturate** (ob′tyoo-rāt′), *v.t.* (۱) داخستن (کون)؛ بەرگرتن؛
ڕێ لێگرتن؛ بەربەستکردن. (۲) داخستن (لوولە تفەنگ).

**obtuse** (əb-tōōs′, ob-tūs′), *adj.* (۱) سەرەکەی تیژ نییە (شێوە)؛
سەرەکەی تەختە نەك تیژ. (۲) کراوە (گۆشە)؛ لە (۹۰) پلە زیاترە و لە (۱۸۰)
کەمتر (گۆشە) *( ~ angle)*.
(۳) بێ مێشك؛ بێ هەست؛ کەودەن؛ کەر؛ دەبەنگ.
(٤) پۆپە خڕ *( an ~ leaf)*.
(٥) ناتوندوتیژ؛ کەم (ئازار)؛ زۆر هەستی پێ ناکرێ: *( an ~ pain)*.
-obtusely *(adv.)*; obtuseness *(n.)*.

**obtuse angle,** گۆشەی کراوە (کە لە ۹۰ پلە زیاترە و لە ۱۸۰ کەمترە).

**obverse** (əb-vūrs′), *adj.* (۱) ڕووی لە تەماشاکەرە؛ ڕووی لە پێشەوەیە.
(۲) بن تەسك. کەڵا *( an ~ leaf)*.
(۳) هاوتا؛ بەرامبەر.
*n.* (۱) ڕوو (پارە، مەدالییە). (۲) ڕووی شت؛ ڕووکار؛ پێش.
(۳) هاوتا؛ بەرامبەر. (٤) بیری هاوتا (ژیربێژی).

**obversion** (əb-vūr′shən, ob-vūr′zhən), *n.* (۱) ڕووتێکردن؛
ڕوو وەرگێڕان و ڕووتێکردن؛ ڕووتێکران. (۲) هەڵهێنانی بیری هاوتا (ژیربێژی).

**obvert** (əb-vūrt′, ob-vūrt′), *v.t.* (۱) ڕووتێکردن؛ ڕوو وەرگەڕاندنی
شتێك بەرەو تەماشاکەر. (۲) ووتن یا خستنە بەرچاوی بیری هاوتا (ژیربێژی).

**obviate** (ob′vi-āt′), *v.t.* لابردن؛ لادان؛ نەهێشتن؛ خۆ لێ لادان؛
تێپەڕاندن؛ ماوبردن: *( to ~ danger, the difficulty, etc.)*.
-obviation *(n.)*.

**obvious** (ob′vi-əs), *adj.* (۱) ئاشکرا؛ دیار؛ ڕوون؛ بێ گومان.
(۲) [Obs.]، لەسەر ڕێدایە؛ ڕێی گرتووە؛ لەبەردەمدایە.

**obviously** (ob′vi-əs-li), *adv.* (۱) بە ئاشکرا؛ ئاشکرایە.
(۲) بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە.

**obviousness** (ob′vi-əs-nis), *n.* ئاشکرایی؛ ڕوونی؛ بێ گومانی

**occasion** (ə-kā′zhən), *n.* (۱) هەل؛ هەڵکەوت؛ ڕێکەوت.
(۲) هۆ: *( A chance meeting was the ~ of the renewal of their friendship.)*
(۳) (أ) ڕوودان؛ ڕووداو. (ب) کاتی ڕوودان.
(٤) بۆنە؛ ڕوودان یا کاتێکی تایبەتی:
*( I wish to express my sorrow on this ~ .)*
(٥) جار؛ کەڕەت؛ کات؛ بۆنە. *( He has said that on several ~s.)*
(٦) پێویستی: *( You have no ~ to be angry.)*.
(۷) [Archaic]، کاروبار
*v.t.* بوون بە هۆ: *( to ~ a riot)*.
  mark the occasion, یادکردنەوە (ڕوودان، بیرەوەری).
  on occasion, جار بە جار؛ جار جار؛ ناوبەناو.
  rise to the occasion, هەڵسان بە پێویستی سەرشان لە ناکاوییەکدا؛
کەوتنە فریا؛ لێهاتوویی نواندن لە ناکاویدا.
  take occasion, هەل هێنان.

**occasional** (ə-kā′zhən-'l), *adj.* (۱) لە کاتێکی تایبەتیدا ڕوودەدات.
(۲) هی کاتی تایبەتی؛ بۆ کاتی تایبەتی.
(۳) جار جار؛ کەم جار؛ بە دەگمەن؛ جار نە جار:
*( an ~ visit to the relatives)*

**occasionally** (ə-kā′zhən-'l-i), *adv.* جار بە جار؛ جاروبار؛
ناوبەناو؛ کەم (جار).

**occident** (ok′sə-dənt), *n.* (۱) [Poetic]، ڕۆژاوا؛ ناوچەکانی ڕۆژاوا.
(۲) [O-]: (أ) ئەورووپا. (ب) بەشی ڕۆژاوای زەمین؛ ئەورووپا و ئەمەریکا.

**occidental** (ok′sə-den′t'l), *adj.* (۱) ڕۆژاوایی؛ هی ناوچەکانی
ڕۆژاوا. (۲) [O-]، هی وولاتە ڕۆژاواییەکان و گەلەکانیان.
*n.* کەسێکی ڕۆژاوایی؛ هاوولاتییەکی وولاتێکی ڕۆژاوا.

**Occidentalism** (ok′sə-den′t'l-iz'm), *n.* ڕۆژاوایەتی. نەریت و
کلتوور و بیروڕاو تایبەخۆی وولاتە ڕۆژاواییەکان.

**Occidentalize** (ok′sə-den′t'l-īz′), *v.t.* وەك ڕۆژاوایی لێکردن
(لە ڕەووشت و بیروڕاو شێوەی ژیاندا).

**occipital** (ok-sip′ə-t'l), *adj.* هی ئێسقانی پشتەوەی کاسەی سەر.
*n.* پشتە ئێسقانی کاسەی سەر

**occipital bone,** پشتە ئێسقانی کاسەی سەر

**occiput** (ok′si-put′), *n.* پشتە ئێسقانی کاسەی سەر؛ پشتی سەر.

**occlude** (ə-klōōd′, o-klōōd′), *v.t.* (۱) داخستن (کون، ڕاڕەو،
ڕێ)؛ گرتن. (۲) ڕێ لێگرتن؛ ڕێ لێ داخستن؛ بەرگرتن: *( to ~ light)*.
(۳) هەڵمژین (کیمیا).
(٤) جووت کردن (ددانی سەرەوە و خوارەوە).
*v.i.* جووت بوونی ددانی سەرەوە و خوارەوە.

**occlusion** (ə-klōō′zhən, o-klōō′zhən), *n.* (۱) داخستن؛
ڕێ لێگرتن؛ بەرگرتن؛ داخران؛ بەرگیران. (۲) جووت کردنی ددانی سەرەوە و

خوارەوە: جووت بوونی ڕیزە ددانی سەرەوەو خوارەوە.
**occult** (ə-kult′, ok′ult), *adj.* (١) شاراوە؛ داپۆشراو.
(٢) پەنهانی؛ نهێنی.
(٣) مرۆڤ ناتوانێ تێی بگات؛ تێگەیشتنی بۆ نییە.
(٤) هی ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەو هونەرە ناناشکرایانەی وەك جادووگەریو ئەستێرەوانی... هتد
*v.t. & v.i.* لەچاو ون بوون (بەتایبەتی ئەستێرە وەك مانگ گیرانو ڕۆژگیران)؛ بەردەم گرتن؛ بەردەم گیران؛ شاردنەوە.
**the occult,** هونەرو لێکۆڵینەوە ناناشکراکان (جادووگەری، ئەستێرەوانی، هەندێ کۆمەڵی بەناو ئاینیو... هتد).
**occultation** (ok′ul-tā′shən), *n.* (١) شاردنەوە؛ شارانەوە؛ لە چاو ون بوون. (٢) لە چاو ون بوونی ئەستێرە (وەك مانگ گیرانو ڕۆژگیران).
**occultism** (ə-kul′tiz′m, ok′əl-tiz′m), *n.* (١) بڕوابوون بە هێزی ناناشکرا (وەك جادووگەری، ئەستێرەوانیو... هتد)؛ هێزی ناناشکرا پەرستێ.
(٢) لێکۆڵینەوەی ئەم هێزە ناناشکرایانە.
**occupancy** (ok′yoo-pən-si), *n.* (١) گرتن؛ دەستبەسەرداگرتن؛ داگیرکردن؛ گرتنە ژێردەست. (٢) (ا) تێ چوون (خانوو)؛ چوونە ناو بە کرێ یا بە کڕین (ب) ماوەی تێدابوون (خانوو، فەرمانگە).
(ج) کرێ گرتەیی؛ تێدابوون. (٣) گرتنە ژێردەستو کردن بە هی خۆ (زەویو خانووی بەرەڵا، شتی بێ خاوەن)
**occupant** (ok′yoo-pənt), *n.* (١) نیشتەنی؛ تێدا دانیشتوو (کرێچی یا خاوەنی خانوو)
*( the ~ of a house, apartment, office, building, etc.)*
(٢) خاوەن (لەڕێی دەستبەسەرداگرتنەوە).
(٣) ئەو کەسەی تێیدایە (پلەوپایە، فەرمانبەری): *( the ~ of this office)* .
**occupation** (ok′yoo-pā′shən), *n.* (١) داگیرکردن
*( an army of ~ ; the ~ of a foreign country)*
(٢) چوونە ناو (خانوو)؛ تێ چوون
(٣) ماوەی تێدا ژیان یا بە کرێ گرتن (خانوو، کێڵگە).
(٤) پیشە؛ کار؛ ئیشوکار.
**occupational** (ok′yoo-pā′shən-'l), *n.* (١) پیشەیی؛ سەبارەت بە پیشە یا کار؛ بەهۆی پیشەوەیە:
*( ~ hazards; an ~ disease)*
(٢) داگیرکەری؛ هی داگیرکەر یا داگیرکەری.
**occupational disease,** نەخۆشی لە ئیشەوە تووش بوو.
**occupational therapy,** چارەکردن بە کارکردن؛ چارەکردنی پیشەیی: چارەکردنی نەخۆشی مێشك یا لەش لەڕێی خەریك بوونی نەخۆشەکە بە ئیشوکارێکی خۆشو بەسوودەوە بۆئەوەی کاتی نەبێ بۆ بیرکردنەوە لە نەخۆشییەکەی.
**occupier** (ok′yoo-pī′ēr), *n.* داگیرکەر؛ دەستبەسەرداگر.
**occupy** (ok′yoo-pī′), *v.t.* (١) داگیرکردن؛ گرتن؛ دەستبەسەرداگرتن:
*( to ~ the enemy's territory)*
(٢) تێدا دانیشتن؛ تێدا جێگیربوون؛ تێدا ژیان:
*( to ~ a house, farm, etc.)*
(٣) گرتنەدەست (کاربەدەستی، فەرمانبەری)؛ تێدابوون (پیشە، کاربەدەستی، کار): *( He has ~ied this important position for two years.)* .
(٤) (ا) گرتن (جێ، کورسی)؛ تێدابوون. *( to ~ a seat)*
(ب) پێچوون؛ کات گرتن: *( Dinner ~ies two hours of hour time.)* .
(٥) خەریك کردن؛ مێشك پێوە خەریك کردن.
(٦) پێوە خەریك بوون؛ خەریك بوون:
*( Workmen were ~ied with building new roads.)*
**occur** (ə-kūr′), *v.i.* (١) هەبوون؛ بوون؛ تێدابوون.
*( Several mistakes ~ on the first page.)*
(٢) بەبیرداهاتن: *( Did it ~ to you to close the windows?)* .
(٣) ڕوودان *( When did the accident ~ ?)*

**occurrence** (ə-kūr′əns), *n.* (١) ڕوودان؛ بەسەرهاتن:
*( The ~ of this disease is rare.)*
(٢) ڕووداو؛ ڕووداوێك؛ بەسەرهات: *( an everyday ~ )* .
-occurrent *(adj.).*
**ocean** (ō′shən), *n.* (١) زەریا؛ دەریالووش؛ ئۆقیانووس؛ زرێ؛ دەریا.
(٢) ئێجگار زۆر؛ فرە: *( ~s of time, money, trouble, etc.)* .
**oceanic** (ō′shi-an′ik), *adj.* (١) زەریایی؛ لە زەریادا دەژی؛ بەرهەمی زەریایە. (٢) زۆر زل؛ ئێجگار گەورە.
**oceanographer** (ō′shən-og′rə-fēr), *n.* زەریاناس؛ زانای ئۆقیانووس.
**oceanography** (ō′shən-og′rə-fi), *n.* زەریاناسی؛ زانستی ئۆقیانووس.
-oceanographic *(adj.).*
**Oceanus** (ō-sē′ən-əs), *n.* خودای ئۆقیانووس (ئەفسانەی یۆنانی).
**ocellus** (ō-sel′əs), *n.* (١) چاوی جانەوەری بێ بڕبڕەی زۆر بچووك.
(٢) خاڵ یا پەڵەی بچووك (وەك هی سەر باڵی تاووس).
**ocelot** (ō′sə-lot′, os′ə-lət), *n.* گیاندارێکی ئەمەریکییە لە پڵنگ ئەچێت؛ بەوری ئەمەریکی.
**ocher** (ō′kēr), *n.* (١) گڵەسوور (کە ئاسنی خاوی تێدایە).
(٢) ڕەنگی سووریاو یا قاوەیی.
*v.t.* ڕەنگ کردن بەم ڕەنگە.
**ochlocracy** (ok-lok′rə-si), *n.* فەرمانڕەوایی ڕووتەوڕووتە؛ فەرمانڕەوایی جەماوەری بۆرەپیاوان.
**ochlocrat** (ok′lə-krat′), *n.* لایەنگری فەرمانڕەوایی ڕووتەوڕووتە.
-ochlocratic *(adj.).*
**-ock** (ək), پاشگرێکە بەمانای: بچکۆلە؛ بچکەلە: *( hillock)* .
**o'clock** (ə-klok′, ō-klok′), بەپێی کاتژمێر؛ سات:
*( three ~ ; eight ~ )*
**ocotillo** (ō′kə-tēl′yō), *n.* ڕووەکێکی دڕکاوی بیابانی گوڵ ئاڵە.
**oct-, octa-, octo-,** پێشگرێکە بەمانای: هەشت.
**octagon** (ok′tə-gon′, ok′tə-gən), *n.* هەشت گۆشە؛ وێنەی هەشتلا.
**octagonal** (ok-tag′ə-n'l), *adj.* هەشت گۆشەیی؛ هەشتلایی.
**octahedral** (ok′tə-hē′drəl), *adj.* هەشت ڕوویی (ئەندازە).
**octahedron** (ok′tə-hē′drən), *n.* هەشت ڕوو (ئەندازە)؛ وێنەی تەنداری هەشت ڕوو.
**octameter** (ok-tam′ə-tēr), *n.* دێڕێکی هۆنراوەی هەشت بڕگەی کێشدار.
*adj.* هەشت بڕگەیی کێشدار.
**octane** (ok′tān), *n.* ئۆکتەین (پەترۆڵ، کیمیا)
**octane number ( or rating ),** پلەی ئۆکتەین لە بەنزیندا.
**octangular** (ok-taŋ′gyoo-lēr), *adj.* هەشت گۆشەیی.
**octave** (ok′tāv), *n.* (١) (ا) هەشتەم ڕۆژی دوای جەژن (خاچ پەرستی).
(ب) ماوەی نێوان جەژنو ئەم هەشتەم ڕۆژە، واتە هەموو هەشت ڕۆژەکە.
(٢) هەشت دێڕی یەکەمی هۆنراوەیەکی چواردە دێڕی کە پێی دەوترێ: " sonnet " . (٣) هەشت دانە؛ دەستەیەکی هەشت دانەیی؛ هەشت.
(٤) ئاوازێکی مۆسیقی کە هەشت پلە لەژوور یا لەخوار ئاوازێکی تایبەتییەوەیە؛ هەشتەم ئاواز.
*adj.* (١) هەشت؛ هەشتی. (٢) هی هەشتەم ئاواز (مۆسیقا).
**octavo** (ok′tāv), *n.* (١) قەوارەی پەڕەیەك کاغەزی چاپکراوە کە هەشت یەکی پەڕەی گەورەیەو پانییەکەی لەنێوان پێنج هەتا شەش گرێ دایەو درێژییەکەیشی لە هەشت هەتا نۆ گرێو نیوە.
(٢) پەڕتووکێك کە پەڕەکانی بەم پانیو درێژییە بن.
*adj.* لە پەڕەی وەك ئەم قەوارەیە پێکهاتووە.
**octennial** (ok-ten′i-əl), *adj.* (١) هەر هەشت ساڵ جارێك ڕوودەدات

(٢) هەشت ساڵ دەخایەنێ.

**octet, octette** (ok-tet′), *n.* (١) دەستەیەکی هەشت دانەیی؛ هەشت دانە. (٢) (ا) پارچەیەك مۆسیقا کە بۆ هەشت سازژەن یا گۆرانی بێژ دانراوە. (ب) ئەم هەشت سازژەنە یا گۆرانی بێژە. (٣) هەشت دێری یەکەمی هۆنراوەیەکی چواردە دێری کە پێی دەووترێ: " sonnet ".

**octillion** (ok-til′yən), *n.* ئۆکتیلیەن. ژمارەیەکە لە ئەمەریکاو فەرەنسادا بریتییە لە یەك و بیست و حەوت سفر لە لای ڕاستییەوە، وەك لە ئینگلتەرەو ئەڵمانیادا بریتییە لە یەك و چل و هەشت سفر لە لای ڕاستییەوە.

**octo-, oct-** (ok′tō, ok-tō′, ok′tə), پێشگرێکە بەمانای: هەشت.

**October** (ok-tō′bẽr), *n.* گەڵاڕێزان؛ ئۆکتۆبەر. مانگی دەیەمی ساڵنامەی گریگۆری.

**octogenarian** (ok′tə-ji-nâr′i-ən), *adj.* هەشتا ساڵە؛ تەمەنی هەشتا ساڵە

*n.* کەسێکی هەشتا ساڵ.

**octonary** (ok′tə-ner′i), *adj.* هەشت؛ هەشتی؛ هەشت هەشت؛ لە دەستەی هەشت هەشت پێکهاتوو.

*n.* (١) دەستەی هەشت دانە؛ دەستەی هەشتی. (٢) هەشت دێری یەکەمی هۆنراوەیەکی چواردە دێری کە پێی دەووترێ: " sonnet " (وشەی " octave " و " octet " ببینە).

**octopod** (ok′tə-pod′), *n.* گیانداری هەشت پەل؛ هەشت پێ.

**octopus** (ok′tə-pəs), *n.* (١) هەشت پێ؛ هەشت پەل؛ ئۆکتۆپەس؛ گیاندارێکی نەرم و لینج و پەل هاوێژی ئاوییە هەشت پەلی هەیە هەر پەلەی دەمێکی مژۆکی پێوەیە بەهۆی ئەم مژۆکانەوە خۆی بە شتەوە دەنووسێنێت. (٢) شتێکی وەك هەشت پەل بەتایبەتی ڕێکخراوێکی پەل هاوێژی بەدەسەڵات کە لەڕێی لقەکانییەوە دەست بکێشێ بەسەر دەزگاو ڕێکخراوی تردا.

**octoroon** (ok′tə-rōōn′), *n.* کەسێکە کە هەشت یەکی خوێنی قولەرەش بێ و حەوت بەشیشی سپی.

**octosyllable** (ok′tə-sil′ə-b′l), *n.* (١) دێرێکی هۆنراوەی هەشت بڕگەیی. (٢) ووتەیەکی هەشت بڕگەیی.

-octosyllabic *(adj.).*

**octroi** (ok′troi), *n.* باجێکە لەسەر هەندێ لەو شتومەکانە دادەنرێ کە دەهێنرێتە ناو هەندێ لە شارەکانی ئەورووپاوە.

**octuple** (ok′too-p′l, ok′tyoo-p′l), *adj.* (١) هەشت ئەوەندە. (٢) هەشت بەشی؛ هەشت پارچەیی.

*n.* شتێك کە هەشت ئەوەندەی شتێکی تر بێ.

*v.t.* لە هەشت دان (ژمارەو پێوان).

**ocular** (ok′yoo-lẽr), *adj.* (١) تایبەتی بە چاو؛ بۆ چاو؛ بە چاو؛ وەك چاو *( ~ exercises)* (٢) هی بینایی؛ تایبەتی بە هێزی بینین: *( an ~ exam)*. (٣) لەبەرچاو؛ بینراو؛ دیار: *( ~ proof)*.

**oculist** (ok′yoo-list), *n.* پزیشکی چاو.

**oculo-, ocul-** (ok′yoo-lō, ok′yoo-lə), پێشگرێکە بەمانای چاو.

**odd** (od), *adj.* (١) تاکی شتێکی جووت کە تاکەکەی تری وون بێت: *( an ~ glove, shoe, or boot)* (٢) تاك (ژمارە)، وەك: (٣، ٥، ٧، ٩... هتد): *( an ~ number)*. (٣) تاك (سەرجەمی ژمارە): *( an ~ month)*. (٤) زیادە؛ ئەوەندە؛ زیاتر: *(fifty and some ~ dollars; thirty ~ years)* (٥) ڕێکەوت؛ ئەوەی ڕێکەوێت؛ هەڵکەوت؛ ئەوەی دەست بکەوێ؛ زیادە: *( He is doing ~ jobs.)* (٦) تاکێك یا چەند ژمارەیەکی دابڕاو لە دەستەیەك: *( a few ~ volumes of an encyclopedia)* (٧) سەیر؛ نائاسا *( How ~ ! ; an ~ person, situation, place, etc.)*

**odd man out,** کەسێکی جیاواز لە تاقم یا کۆمەڵەکەی؛ کەسێکی بە تەنها ماوە (لەبەر جیاوازی لەوانەی دەورووپشتی).

**odd-ball** (od-bôl′), *n.* [Colloq.], کەسێکی سەیر (لە ڕەووشت و بیروباوەڕیدا).

**oddish** (od′ish), *adj.* نەختێك سەیر؛ نەختێك نائاسا

**oddity** (od′ə-ti), *n.* (١) نائاسایی؛ سەیری؛ سەیرێتی. (٢) تایبەخۆیەکی سەیر یا نائاسا؛ خوو ڕەووشتێکی سەیر. (٣) کەسێکی سەیر؛ شتێکی سەیر.

**oddment** (od′mənt), *n.* (١) پاشماوە؛ پڕوپیت؛ سەرە مقەست؛ ووردکەوپرتکە. (٢) ئەو پەڕانەی پەرتووکێك کە بە دەقی پەرتووکەکە نازمێررێ وەك پەڕەی ناونیشانی پەرتووکەکە.

**odds** (odz), *n.pl.* (١) ناهاوتایی؛ شتی ناهاوتا. (٢) ڕێژەی لەوانەبوونی ڕوودانێك یا ئەنجامەکەی (گرەو): *( The ~ on the champion winning are three to one.)* (٣) جیاوازی نێوان دوو تیپی ملەملێکەرو لەوانەبوونی بردنەوەی لایەکیان (٤) ئەو خاڵە زیادانەی دەدرێت بە تیپی لاواز لە ملەملێیەکدا لە سەرەتاوە بۆ هاوتاکردنی لەگەڵ تیپە بەهێزەکە.

at odds, ناکۆك؛ شەڕیانە؛ دانووڵەیان بەیەکەوە ناکوڵێ؛ نارێکن.

by all odds, بە مسۆگەری؛ بێ گومان.

the odds are, لەوانەیە؛ زۆر لەوانەیە.

**odds and ends,** ووردکەوپرتکە؛ پڕوپیت؛ وورده بابەت؛ سەرە مقەست؛ شتی ماوە.

**ode** (ōd), *n.* (١) هەڵبەستی گۆرانی؛ هۆنراوەیەك کە بۆ گۆرانی دەشێت. (٢) هەڵبەستێکی پڕ هەستی بەرز کە بەسەر کەسێك یا شتێکدا هەڵدەدرێت

**-ode** (ōd), پاشگرێکە بەمانای: ڕێگە؛ ڕێباز؛ ڕێڕەو.

**-ode** (ōd), پاشگرێکە بەمانای: وەك.

**odious** (ō′di-əs), *adj.* بۆگەن؛ پیس؛ ناشرین.

**odium** (ō′di-əm), *n.* (١) بۆگەنی؛ پیسی؛ ناشرینی. (٢) ڕق؛ قین؛ کینە (٣) شەرمەزاری؛ نابرووچوون.

**odograph** (ō′də-graf′, ō′də-gräf′), *n.* (١) odometer. (٢) هەنگاوژمێر: نامێرێکە ژمارەو درێژی و خێرایی هەنگاوی کەسێك دەژمێرێ

**odometer** (ō-dom′ə-tẽr), *n.* دووری ژمێر: نامێرێکە دووری ئەو ڕێگەیە دەپێوێ و تۆمار دەکات کە ئوتومبیلێك دەیبڕێ بە میل یا کیلۆمەتر

**-odont** (ə-dont′), پاشگرێکە بەمانای: ددان.

**odonto-** (ō-don′tō, ō-don′tə), پێشگرێکە بەمانای: ددان.

**odontology** (ō′don-tol′ə-ji, od′on-tol′ə-ji), *n.* ددانسازی؛ پزیشکایەتی ددان؛ زانستی ددان و نەخۆشییەکانی.

**odor, odour** (ō′dẽr), *n.* (١) بۆن (بەتایبەتی هی ناخۆش). (٢) [Archaic]، گوڵاو؛ بۆنی خۆش. (٣) تایبەخۆیەکی زاڵ. (٤) ناوبانگ؛ ناو؛ ڕێز: *( to be in bad ~ )*.

**odorant** (ō′dẽr-ənt), *n.* ماددەی بۆندار (کە دەکرێتە شتێکی ترسناکی بێ بۆنەوە بۆ ووریاکردنەوەی خەڵك).

**odorless** (ō′dẽr-lis), *adj.* بێ بۆن.

**odorous** (ō′dẽr-əs), *adj.* بۆندار.

**odour** (ō′dẽr), *n.* = odor.

**Odyssey** (od′ə-si), *n.* (١) داستانی " ئۆدیسی " یۆنانی بەناوبانگ کە لە سووڕانەوەی دە ساڵەی " ئۆدیسیەس " دەدوێ. (٢) [o-]، گەشتێکی دوورودرێژ؛ چەند گەشتێکی دوایی نەهاتوو؛ سووڕانەوەیەکی زۆر.

**Oedipal, oedipal** (ed′ə-pal, ēd′ə-pal), *adj.* ئۆدیپی؛ تایبەتی بە نەخۆشی " ئۆدیب " (دەروونناسی). (ووشەی دوایی ببینە).

**Oedipus complex,** نەخۆشی " ئۆدیب " : بریتییە لە حەزکردنی کوڕ لە دایکی و ڕق لێ بوونی لە باوکی وە هەروەها حەزکردنی کچ لە باوکی و ڕق لێ بوونی لە دایکی (دەروونناسی)

**oenology** (ē-nol′ə-ji), *n.* شەراب ناسی؛ مەی ناسی.

**o'er,** [Poetic], = **over.**
**oesophagus** (i-sof'ə-gəs), *n.* = **esophagus.**
**oeuvre** (ö'vr'), *n.* [Fr.], (١) بەرهەمێکی هونەری (پەرتووک، تابلۆ، شانۆنامە... هتد). (٢) سەرجەمی بەرهەمی هونەر، نووسەر، یا هونەرمەندێك.
**of** (uv, ov), *prep.* (١) ~ ی، لە، هی:
***( ~ a good family; men ~ Kurdistan)***
(٢) لە، بەهۆی، بە ***( He died ~ starvation)***.
(٣) لە دووری: ***( a mile east ~ the river)***.
(٤) ~ ی ***( the plays ~ Shakespeare)***
(٥) لێی، لە: ***( cured ~ his disease; robbed ~ his money)***
(٦) لە ***( one ~ his brothers)***
(٧) لێ دروستکراو: ***( made ~ plastic)***
(٨) هی ~ ی ***( the leaves ~ the book)***
(٩) هەبوون، خاوەن بوون ***( a man ~ property)***.
(١٠) ~ ی: ***( the State ~ California)***
(١١) ~ ی ***( a man ~ words; a reader ~ books)***
(١٢) دەربارە، لەبابەت، لێ: ***( Don't think harshly ~ me.)***.
(١٣) ~ ی، بۆ، بۆ تەرخان کراو ***( a week ~ festivities)***.
(١٤) لە ماوە لەم: ***( ~ late)***.
(١٥) نەیبش، نەیەوێ (کات ژماردن) ***( It is ten ~ eight.)***.
**off** (ôf), *adv.* (١) ئەولاوە ***( He moved ~ toward the door.)***.
(٢) داکەندن ***( He took ~ his coat.)***
(٣) لێکردنەوە ***( She tore a sheet ~ .)***
(٤) دوور ***( The ocean is fifty yards ~ .)***.
(٥) دوور، کات: ***( My vacation is only one week ~ .)***.
(٦) کوژاندنەوە ***( He turned the motor ~ .)***
(٧) تەواوکردن، هیچ نەهێشتنەوە: ***( Drink it ~ .; Kill them ~ .)***.
(٨) کەم بوونەوە: ***( The number of customers dropped ~ .)***.
(٩) پشوودان ***( Let's take the day ~ .)***
*prep.* (١) لە فەراغ، لە دەرەوەی ***( The car is ~ the road.)***.
(٢) بە، لەسەر ***( She lives ~ her savings.)***
(٣) لێی جیابووەتەوە (ڕێ، لق) ***( an alley ~ the main street)***
(٤) ئازاد، دەستبەتاڵ، لە دوای کار: ***( ~ duty)***
(٥) دانەواوە، بەرەو خراپی ڕۆیشتن: ***( badly ~ one's game)***
(٦) تەرک کردن، وازهێنان ***( He's ~ liquor for life.)***
*adj.* (١) داکەنراو ***( His hat is ~ .)***.
(٢) کوژاوە، کوژاوەتەوە: ***( The motor is ~ .)***
(٣) ڕۆیشتوو، چوون ***( The children are off to school.)***.
(٤) کەم، کەمتر، شکاو (پلە) ***( Profits are ~ this year.)***
(٥) لە پشووداندایە، ئازادە، دەستی بەتاڵە ***( She is ~ today.)***.
(٦) باری ژیان ***( They are well ~ .)***.
(٧) بەهەڵەداچوو ***( You are ~ in your calculations.)***.
(٨) کەم ئەوانەبوون، کەم ڕێی تێ دەچێ ***( an ~ chance)***
(٩) کەم برەو ***( Business is quite slow during the ~ season.)***.
(١٠) ناتەواو، مێشك، شێت، سەیر ***( He is a little ~ .)***.
(١١) لای ڕاستی ئۆتومبێل یا گالیسکە ***( The ~ horse is lame.)***.
(١٢) دیوی دەریا (کەشتیوانی)
*interj.* برۆ! لاچۆ! لاچۆ لەبەرچاوم!
**badly off,** بێ دەرامەت، دەستکورت، بێ گوزەران
**get off,** دابەزین
**off and on,** ناوبەناو، جار بە جار، جار جار، جار نە جار
**off the mark,** (١) نەپێکان
(٢) دوور نە باسەوە، پەیوەندی بە باسەکەوە نییە
**off with,** دایکەنە، لایبە
**off with you!,** دە برۆ! دە لاچۆ! لاچۆ لەبەرچاوم!

**take off,** (١) داکەندن.
(٢) [Colloq.]، ڕۆیشتن، چوون (گەشت):
***( They took off to New York an hour ago.)***
(٣) هەڵسان (فڕۆکە): ***( The plane didn't take off.)***
**well off,** خۆش گوزەران، دەوڵەمەند.
**offal** (ôf''l, of''l), *n.* (١) ڕیخۆڵەو ناوسك و سەروپێی گیاندارێکی سەربڕاو. (٢) پاشماوە، بەرماوەی فڕێدراو.
**offbeat** (ôf'bēt'), *adj.* [Colloq.], نەگونجاو لەگەڵ شێوازو نەریت و ڕێبازی ئێستا و کۆندا، نائاسایی، جیاواز.
**off-cast** (ôf'kast', ôf'käst'), *adj. & n.* نەویستراو، فڕێدراو، پەسەند نەکراو.
**off-chance** (ôf'chans', ôf'chäns'), *n.* زۆر لەوانە نییە، ناشێ، کەم ڕێی تێ دەچێ.
**off-color** (ôf'kul'ẽr), *adj.* (١) جیا لە ڕەنگی ئاسایی، ڕەنگەکەی زۆر باش نییە. (٢) ناشرین (ڕەفتار، ووتە، کردار)، نابەجێ: ***( an ~ joke)***.
(٣) [Chiefly British]، بێ کەیف، تەندروستی تەواو نییە، بێ تاقەت، پەست.
**offence** (ə-fens'), *n.* = **offense.**
**offend** (ə-fend'), *v.i.* (١) گوناه کردن، یاسای ئاینی شکاندن، تاوان کردن. (٢) زویرکردن، تووڕەکردن، پەستکردن، ڕەنجاندن.
*v.t.* (١) زویرکردن، زیزکردن، تووڕەکردن، دڵ شکاندن، دڵ ڕەنجاندن.
***( His rude remarks ~ed many people.)***
(٢) پێ ناخۆش بوون، بەدڵ نەبوون: ***( Loud music ~s my ears.)***.
(٣) [Obs.]، (ا) پەرژین شکاندن، دەستدرێژی کردن، سنوور شکاندن
(ب) گوناه پێ کردن.
**offense, offence** (ə-fens'), *n.* (١) تاوان، تاوانکاری، گوناه، پەرژین شکاندن، سنوور شکاندن. (٢) کارێکی ناپەسەندو زویرکەر، کارێکی بەدو تووڕەکەر. (٣) زویرکردن، پەستکردن، تووڕەکردن.
(٤) هێرش، هێرش کردن (٥) هێرشکەر، هێرشبەر.
**give offense,** زویرکردن، پەستکردن، تووڕەکردن، دڵ ڕەنجاندن.
**no offense,** [Colloq.], ببورە مەبەستم ئەوە نییە زویر بیت یا دڵت برەنجێ، ببورە!
**take offense,** زویربوون، پێ ناخۆش بوون، دڵ ڕەنجان، پەست بوون
**offenseless** (ə-fens'lis), *adj.* کەس پێی زویر نابێ، کەس پێی ناخۆش نابێ، دڵ نارەنجێنێ.
**offensive** (ə-fen'siv), *adj.* (١) هی هێرش، بۆ هێرش کراوە:
***( ~ weapons)***
(٢) بۆگەن، پیس: ***( an ~ smell)***.
(٣) ناپەسەند، ناشرین (کردەوە، ووتە)، بەد، تووڕەکەر، زویرکەر
***( an ~ act ; ~ language)***
*n.* (١) دەستپێشکەری، هەڵوێستی هێرش بردن: ***( to take the ~ )***.
(٢) هێرش (سوپا، پروپاگەندە، هەڵبژاردن): ***( a military ~ )***
**offer** (ôf'ẽr, of'ẽr), *v.t.* (١) پێشکەش کردن (قوربانی، نزا)، بۆ کردن:
***( He will ~ prayers.; They are ~ing up sacrifices.)***
(٢) پێشکەش کردن (خەڵات، یارمەتی، خواردەمەنی)، پێ بەخشین:
***( I ~ed my services.; Have you ~ed a reward?; They ~ed us food.)***
(٣) پێدان: ***( She ~ed her suggestions.)***.
(٤) پیشاندان: ***( to ~ resistance to the enemy)***.
(٥) پێدان (نرخ).
(٦) خستنە پێش چاو بۆ فرۆشتن.
*v.i.* (١) قوربانی پێشکەش کردن، نزاکردن.
(٢) ڕوودان، هاتنە پێشەوە (هەل).
*n.* (١) پێشکەشی، پێشکەشکەری: ***( an ~ of assistance)***.
(٢) شتێکی پێشکەش کراو، پێشنیاز، داواکردن (بۆ شووپێکردن)

***( a job ~ ; She has had several marriage ~s.)***

(٣) پیشنیاز (داد‌گەری).

(٤) هەوڵ؛ تەقەلا.

**offer one's hand,** (١) دەست درێژکردن بۆ تەوقەکردن.

(٢) داواکردن؛ خوازبێنی کردن.

**offering** (ôf′ẽr-iŋ, of′ẽr-iŋ), ***n.*** (١) پێدار. ***( the ~ of bribes)*** .

(٢) شتێکی پێشکەش کراو یا دراو (قوربانی، خەڵات، پیتاك، دۆعا).

**offertory** (ôf′ẽr-tôr′i, of′ẽr-tō′ri), ***n.*** (١) نوێژێکی تایبەتییە لە کڵێسەی ئینگلیزیدا. (٢) پیتاکی کۆکراوە لە کڵێسەدا.

**offhand** (ôf′hand′), *adv.* بەبێ بیرکردنەوەو خۆ ئامادەکردن

***( I couldn't give you the figures ~ .)***

***adj.*** (١) سەرپێیی؛ لاسەرلایی؛ بێ ئامادەکردن: ***( ~ remarks)*** .

(٢) ناشرین (ڕەفتار)؛ بێ ئەزاکەت؛ نابەجێ: ***( He acted in an ~ way.)*** .

**offhanded** (ôf′hand′), *adj.* = offhand.

**office** (ôf′is, of′is), ***n.*** (١) هەوڵ؛ هەوڵدان؛ تەقەلا:

***( This was done through his good ~s .)***

(٢) ئەرك؛ ئەركی سەرشان؛ کار.

(٣) پلەوپایە؛ پایە: ***( the ~ of president)***

(٤) (أ) دەزگا؛ بەڕێوەبەرایەتی. ***( the Post O~ )*** .

(ب) [British]، شالیارگە؛ وەزارەت. ***( the foreign ~ )*** .

(٥) (أ) فەرمانگە.

(ب) هەموو فەرمانبەرانی فەرمانگەیەك؛ کاربەدەستانی فەرمانگەیەك.

(٦) (أ) ژووری کارکردنی بەردەستەکانی ماڵێکی گەورە (چێشتخانە، ژووری حل شتن، تەویلە).

(٧) ئاهەنگی ئاینی کڵێسە؛ نوێژی بە کۆمەڵ

**office boy,** بەردەستی فەرمانگە؛ بەردەست؛ کارگوزار؛ فەراش.

**office-holder** (ôf′is-hōl′dẽr, of′is-hōl′dẽr), ***n.*** کاربەدەست؛ فەرمانبەر

**office hours,** (١) کاتی دەوام؛ فەرمانگە یا فەرمانبەر؛ کاتی ئیش.

(٢) کاتی دانیشتنی مامۆستا لە ژوورەکەی (بۆ ئامۆژگاری قوتابی).

**officer** (ôf′ə-sẽr, of′ə-sẽr), ***n.*** (١) کاربەدەست (میری، کۆمپانیا، یانە، دەزگای کۆمەڵایەتی... هتد)؛ فەرمانبەر. (٢) ئەفسەر.

(٣) ئەفسەری پۆلیس؛ پۆلیس: ***( a police ~ )*** .

(٤) کەشتیوانی کەشتییەکی بازرگانی.

**official** (ə-fish′əl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە پلەوپایەو ئەرکی کاربەدەستێك ***( ~ responsibilities; an ~ uniform)***

(٢) ڕەسمی؛ میرکاری؛ میریگەری.

***( an ~ statement, reply, invitation, etc.)***

(٣) دەشێت بۆ پلەوپایەی کاربەدەستێك.

(٤) پەسەندکراوە بۆ بەکارهێنان (دەرمانسازی)

***n.*** کاربەدەست؛ فەرمانبەر: ***( government ~s)*** .

**officialdom** (ə-fish′əl-dəm), ***n.*** (١) چینی کاربەدەستان؛ سەرجەمی فەرمانبەران. (٢) **officialism**

(٣) پلەوپایەو دەسەڵات و کاری فەرمانبەران

**officialism** (ə-fish′əl-iz′m), ***n.*** (١) ڕۆتین پەرستی فەرمانبەران؛ لە ڕادە بەدەر پەیڕەوی کردنی ڕۆتین لەلایەن فەرمانبەرانەوە.

(٢) چینی فەرمانبەران؛ هەموو کاربەدەستان

**officially** (ə-fish′əl-i), ***adv.*** بە ڕەسمی؛ بە شێوەیەکی میرکاری

**officiant** (ə-fish′i-ənt), ***n.*** پێش نوێژ (کڵێسە).

**officiary** (ə-fish′i-er′i), ***n.*** دەستەیەك فەرمانبەران.

***adj.*** بەهۆی پلەوپایەکەیەوەیە

**officiate** (ə-fish′i-āt′), ***v.i.*** (١) ئەرکی پلەوپایە بەجێهێنان:

***( to ~ as a chairman, master of ceremonies, etc.)***

(٢) ئەرکی قەشە بەجێهێنان (پێش نوێژی، مارەبڕین... هتد):

***( to ~ at a marriage)***



-officiation *(n.)*; **officiator** *(n.)*.

**officious** (ə-fish′əs), ***adj.*** (١) [Obs.] چاکەکەر؛ ئامادەی یارمەتی؛ چاوبەرەوژێرکەر. (٢) خۆتێهەڵقورتێنەر؛ دەست خەرە ناو کاروباری خەڵکەوە

(٣) نارەسمی: ***( an ~ statement)*** .

**offing** (ôf′iŋ), ***n.*** (١) ئاسۆی دەریا؛ دوورترین بەشی دەریا کە لە کەناری دەریاوە دیاربێت. (٢) شوێنێکی نەختێك دوور لە کەنار دەریاوە

(٣) دوارۆژی نزیك.

**in the offing,** (١) بە ئاستەم دیارە لە کەناری دەریاوە؛ لە ئاسۆی دەریاوە.

(٢) دوورە بەڵام بە چاو دەبینرێ.

(٣) لە دوارۆژێکی نزیکدا؛ نزیك؛ بە دەستەوەیە (ڕوودان، کار، پرۆژە... هتد)

***( a quarrel in the offing)***

**offish** (ôf′ish), ***adj.*** [Colloq.], گۆشەگیر؛ دوورەپەرێز؛ تەریك.

**offprint** (ôf′print′), ***n.*** ووتارێکی سەرلەنوێ لەچاپدراو کە لەوەوپێش بڵاوکرابێتەوە

***v.t.*** لە چاپ دانەوەی ووتارێك یا بەشێکی پاش بڵاوکردنەوەی لە گۆڤارێکی گەورەدا.

**offscouring** (ôf′skour′iŋ), ***n.*** **usually plural,** (١) پیسایی کە لە دەفرێك یا شتێك کرابێتەوە بە شتن).

(٢) کەسێکی دەربەدەر؛ ئاوەکی؛ تەرە.

**offset** (ôf′set′), ***n.*** (١) لق؛ تەرز (٢) پارسەنگ؛ هاوسەنگکەر.

(٣) تاق؛ ڕەفە.

(٤) تەرزێك کە ڕەگ دادەکوتێ و دەبێتە ڕووەکێکی تازە.

(٥) پێچی بۆری یا شیش (بۆ کردنی بە شوێنێکدا).

(٦) هێڵێکی ئەلەکتریکی جیابووەوە لە هێڵی سەرەکی.

(٧) (أ) جۆرێکە لە چاپکردن (ب) لەکەی مەرەکەبی لاپەڕەیەکی تازە چاپکراو کە لاپەڕەکەی تەنیشتی پیس دەکات.

***v.t.*** (١) پارسەنگ گرتنەوە؛ هاوسەنگ کردن؛ هاوتاکردن؛ سڕینەوە؛ پاك لە پاك کردن: ***( His gains will ~ his losses.)*** .

(٢) (أ) چاپکردن بە شێوەیەکی تایبەتی.

(ب) لەکەدارکردنی لاپەڕەیەك بە مەرەکەبی لاپەڕەکەی تەنیشتی (چاپەمەنی)

***v.i.*** (١) تەرزفڕێدان؛ ڕەگ داکوتان و بوون بە ڕووەکێکی تازە (تەرز).

(٢) لەکەداربوونی لاپەڕەیەك بە مەرەکەبی لاپەڕەکەی تەنیشتی.

**offset printing,** چاپی "ئۆفسێت": بریتییە لە دەرهێنانی قاڵبی تیپەکان لەسەر لاستیکی مەرەکەباوی و گواستنەوەی بۆ سەر کاغەز.

**offshoot** (ôf′shōōt′), ***n.*** تەرز؛ لق؛ چووز؛ وەچ؛ ئەنجام:

***( an ~ of a plant, family, party, mountain range, etc.)***

**offshore** (ôf′shôr′, ôf′shōr′), ***adj.*** (١) لە کەناری دەریاوە هەڵکردوو یا هاتوو ***( an ~ wind)*** .

(٢) دوور لە کەنار دەریاوە ***( ~ drilling for oil)*** .

***adv.*** دوور لە کەنار دەریاوە: ***( The storm moved ~ .)*** .

**offside** (ôf′sīd′), ***adj.*** لەبەردەمی تۆپەکەدایە لەبەرئەوەی قەدەغەیە یاری پێ بکات (یاری فوتبۆڵی ئەمەریکی)

**offspring** (ôf′spriŋ′), ***n.*** (١) نەوە؛ وەچە؛ منداڵ؛ وەجاخ؛ بێچوو؛ بەچکە؛ جگەرگۆشە؛ فرزەند: ***( She has three ~s .)*** .

(٢) ئەنجام؛ بەرهەم؛ بەر

**off-stage** (ôf′stāj′), ***n.*** پشتەوەی شانۆ

***adj.*** (١) لە پشتەوەی شانۆوە: ***( an ~ whisper)*** .

(٢) دوور لە شانۆوە؛ دوور لە بینایی سەیرکەرانەوە.

***adv.*** (١) بەرەو پشتەوەی شانۆ. ***( He went ~ .)*** .

(٢) دوور لە شانۆو بینایی تەماشاکەرانەوە.

**off-white** (ôf′hwīt′), ***adj. & n.*** ڕەنگی سپی وەك خوری؛ ڕەنگی خوری؛ ڕەنگی سپی کە زۆر سپی نەبێت.

**oft** (ôft), *adv.* [Rare or Poetic], = **often.**

**often** (ôf′n), ***adv.*** زۆر جار؛ گەلێك جار؛ فرە جار؛ جارەها.

**oftentimes** (ôf′n-tīmz′, ôf′t'n-tīmz′), ***adv.*** = **often.**

**ofttimes** (ôf′tīmz′, ôft′tīmz′), *adv.* [Arch. or Poetic]. often.
**ogive** (ō-jīv, ō-jīv′), *n.* (١) پەراسووی دیلای جۆرێکە لە قاسە.
(٢) تاقی سووچ تیژ
**ogle** (ō′g'l), *v.i. & v.t.* چاوبازی کردن؛ چاوباشقالی کردن؛
بە حەزەوە سەیرکردن
*n.* چاوبازی؛ چاوباشقالی؛ سەیرکردنێکی بە حەزەوە.
**ogre** (ō′gēr), *n.* (١) دەعبای بیارخور (فۆلکلۆر)؛ دەعبا
(٢) کەسێکی درندەی دڵرەقی ناشرین
-**ogreish; ogrish** *(adj.).*
**ogress** (ō′gris), *n.* دەعبای مێینە (وشەی پێشوو ببینە).
**oh** (ō), *interj. & n.* ئاه! ئۆه! هۆ! دەنگێکە سەرسامی، ترس، توورەیی،
ئازار، یا بێزاری پێ دەردەبڕێت
**oil** (oil), *n.* (١) ڕۆن؛ چەوری
(٢) نەوت؛ بەترۆل؛ ڕۆنی چەورکردن و پاک کردنەوە.
(٣) بۆیەی ڕۆن (نیگارکێشی) (٤) تابلۆی بۆیەی ڕۆن
(٥) [Colloq.] مەرایی؛ ڕووانەت؛ کلکەلەقێ
*v.t.* (١) ڕۆن تێ کردن؛ بە ڕۆن چەورکردن (مەکینە) (٢) بەرتیل پێدان
*v.i.* بوون بە ڕۆن بە تواندنەوە
*adj.* ڕۆن؛ ڕۆنی؛ هی ڕۆن؛ هی نەوت یا پەترۆل
**pour oil on troubled waters,** شەڕ کوژاندنەوە؛ ناوبژی کردن
**pour [throw] oil on the flames,** شەڕ گەرم کردن؛ هەرا زل کردن
**strike oil,** (١) بیرە نەوت دۆزینەوە
(٢) لەپڕ دەوڵەمەندبوون؛ لەپڕ شتێکی بەنرخ دۆزینەوە
**oil-cloth** (oil′klôth′), *n.* مشەممای سەر مێز و ڕەفە
**oil color,** بۆیەی ڕۆنی (نیگارکێشی)
**oiler** (oil′ēr), *n.* (١) مەکینە چەورکەر
(٢) دەفری ڕۆنی مەکینە چەورکردن (٣) کەشتی نەوت.
(٤) کەشتی نەوت بەکارهێنەر (٥) بیری نەوت.
(٦) [Colloq.] چاکەتی مشەمما
**oil field,** نەوتخانە؛ نەوتگا؛ چاڵە نەوت
**oil of vitriol,** ڕۆنی زاج؛ ترشی گۆگردیت؛ ترشی کبریتیک
**oil paint,** بۆیەی ڕۆن
**oil painting,** (١) تابلۆی بۆیەی ڕۆن (٢) نیگارکێشان بە بۆیەی ڕۆن.
**oilskin** (oil′skin′), *n.* (١) مشەمما (٢) (*pl.*) جل و بەرگی مشەمما
**oil well,** بیرە نەوت
**oily** (oil′i), *adj.* (١) لە ڕۆن دەچێ؛ لە نەوت دەچێ (٢) چەور
(٣) خز؛ لووس (٤) زمان لووس
**ointment** (oint′mənt), *n.* مەلحەم؛ شتێکە بۆ چەورکردن و
هەنوونی لەش
**O.K., OK** (ō′kā′), *adj., adv., interj.* باشە؛ چاکە؛ ئێ؛
بەڵێ باشە؛ دەچێ
*n.* پەسەندکاری؛ پەسەندکردن: *( We would like to have your ~.)*
*v.t.* پەسەندکردن: *( to ~ a plan)*.
**oka, oke** (ō′kə), *n.* هۆقە (کێشانە)
**okapi** (ō-kä′pi), *n.* گیاندارێکی ئەفەریقاییە لە توخمی زەڕافە، بەڵام
ملی کورتە
**okay** (ō′kā′), *adj., adv., interj., n. & v.t.* [Colloq.] = **O.K.**
**Okie** (ō′ki), *n.* وەرزێرێکی کۆچکەر لە "ئۆکلاهۆما" وە بۆ ناوچەکانی
تری ئەمەریکا (لەڕووی سووکییەوە).
**okra** (ō′krə), *n.* بامێ.
**old** (ōld), *adj.* (١) پیر؛ بەسەڵداچوو
*( an ~ man, woman, etc.)*
(٢) تەمەنی ئەوەندەیە: *( She is seven years ~.)*.
(٣) کۆن؛ کۆنە *( an ~ pair of shoes)*
(٤) پەڕپووت؛ کۆن و دڕاو.
(٥) پێشوو؛ هی پێشوو یا ڕابردوو.
(٦) شارەزا: *( He is an ~ hand at that work.)*.
(٧) دێرین؛ کۆن: *( an ~ civilization, culture, etc.)*.
(٨) کۆن: *( an ~ tradition)*.
(٩) کۆن؛ کۆنەکە (هی دوو شت یا زیاتر). *( The O~ Testament)*
(١٠) [Colloq.]، خۆشەویست: *( good ~ Jack)*.
(١١) [Colloq.]، خۆش؛ پڕ لە کەیف: *( a high ~ time)*.
*n.* (١) دێرین؛ کۆن؛ زەمانی کۆن: *( days of ~ )*.
(٢) خەڵکی پیر؛ پیران.
(٣) کەسێک لە تەمەنێکی تایبەتیدا: *( a three-years ~ )*.
**the old,** خەڵکی پیر؛ پیران.
**old age,** پیری.
**old country,** نیشتمانی کۆنی کۆچەر.
**olden** (ōl′d'n), *adj.* [Poetic], دێرین؛ کۆن؛ زۆر کۆن:
*( in the ~ times; in ~ days)*
**Old English,** زمانی ئینگلیزی کۆن (کە ئەنگلۆ-ساکسۆنییەکان
بەکاریان هێناوە لە ئینگلتەرە لە سەدەی پێنجەمەوە تا دوازدەهەم)
**old-fashioned** (ōld′fash′ənd), *adj.* (١) کۆنەباو؛ کۆن
*( an ~ dress)*
(٢) کۆن پەرست؛ کۆنەپەرست؛ لەسەر ڕێ و شوێنی کۆن ڕۆیشتوو:
*( an ~ girl, man, etc.)*
**old fogy, old fogey,** کەسێکی زۆر کۆنەپەرست (ڕەفتار).
-**old-fogyish; old-fogeyish** *(adj.).*
**Old Glory,** ئاڵای ئەمەریکا؛ بەیداخی ئەمەریکا.
**old hand,** کەسێکی زۆر شارەزا یا قاڵ
**old hat,** [Slang], (١) کۆن؛ کۆنباو؛ کۆنەپەرست
(٢) پەڕپووت؛ کۆن و بێ مانا.
**oldish** (ōld′ish), *adj.* ئەختێک کۆن.
**old lady,** [Slang], (١) دایک. (٢) هاوسەر؛ ژن
**old-line** (ōld′līn′), *adj.* (١) کۆن؛ لە دەمێکەوە هەیە
(٢) کۆن پەرست؛ کۆنەپەرست
**old maid,** (١) گەورە کچ؛ قەیرە کچ؛ پیرە کچ.
(٢) کەسێکی بە قێزوبێز و توورەوترۆ.
(٣) یارییەکی کاغەزە.
-**old-madish** *(adj.).*
**old man,** [Slang]. (١) باوک. (٢) مێرد.
(٣) سەرگەورە؛ سەرۆک؛ کاربەدەست (ئەفسەر، کەشتیوان... هتد)
**old master,** (١) یەکێک لە نیگارکێشە بەناوبانگەکانی ئەورووپای پێش
سەدەی هەژدەهەم؛ مامۆستای گەورە. (٢) تابلۆی هەریەکێک لەم نیگارکێشانە
**old school,** دەستەی کۆنەپەرستان؛ قوتابخانەی کۆن (مەجاز)؛
ئەوانەی بە شێوەی کۆن بیردەکەنەوە.
**old squaw,** جۆرە مراوییەکی دەریایە.
**oldster** (ōld′stēr), *n.* [Colloq.], کەسێکی پیر؛ کەسێکی بەساڵداچوو.
**Old Testament,** بەشی یەکەمی ئینجیل؛ ئینجیلی کۆن.
**old-time** (ōld′tīm′), *adj.* کۆن؛ هی کۆن؛ وەک هی کۆن
**old-timer** (ōld′tīm′ēr), *n.* [Colloq.]. (١) کەسێکە کە دەمێک بێ
لە شارێکدا بژی یا لە شوێنێکدا ئیش بکات یا لە ڕێکخراوێکدا ئەندام بێ
(٢) کەسێکی شارەزا یا قاڵ (٣) کەسێکی کۆنەپەرست.
(٤) کۆنە؛ شتێکی کۆن یا کۆنەباو.
**old wives' tale,** (١) چیرۆکی پڕوپیرێژن.
(٢) ئەفسانە؛ باوەڕی پڕوپووچ؛ شتێکە کە جێی بڕوا نییە.
**old-womanish** (ōld′woom′ən-ish), *adj.* پیرێژنی؛
بە قێزوبێز و ترسنۆک.
**old-world** (ōld′wûrld′), *adj.* (١) (ا) هی دێرین؛ هی ساڵانی زوو.

(ب) كۆنەپەرست؛ كۆنەباو؛ ئەنتیكە

(٢) [O-W-] هی جیهانی كۆن (ووشەی داهاتوو ببینە).

**Old World,** جیهانی كۆن كە ئەورووپاو ئاسیاو ئەفەریقا دەگرێتەوە بەتایبەتی ئەورووپا

**oleaginous** (ō′li-aj′i-nəs), *adj.* (١) چەور؛ ڕۆناوی؛ ڕۆندار؛ لە ڕۆن دەچێ (٢) خز؛ لووس؛ دەم لووس

**oleander** (ō′li-an′dẽr), *n.* ژاڵە.

**oleaster** (ō′li-as′tẽr), *n.* زەیتونی كێوی

**oleic** (ō-lē′ik, ō′li-ik), *adj.* ڕۆنی؛ لە ڕۆن دەرهاتوو.

**oleic acid,** ترشی ئولیك لە ڕۆن و چەوریدا هەیە

**oleomargarine** (ō′li-ō-mär′jə-rin), *n.* = margarine.

**olfaction** (ol-fak′shən), *n.* (١) هەستی بۆن كردن. (٢) بۆن كردن

**olfactory** (ol-fak′tẽr-i), *adj.* هی هەستی بۆن كردن.

*n.* (١) ئەندامی بۆن كردن. (٢) هەستی بۆن كردن

**olfactory nerve,** هەستەدەماری بۆن كردن.

**oligarch** (ol′i-gärk′), *n.* ئۆلیگارك فەرمانڕەوایی وڵاتێك كە چەند كەسێكی كەم یا خێزانێك بەڕێوەی بەرێت.

**oligarchy** (ol′i-gär′ki), *adj.* ئۆلیگاركی (١) ڕژێمێكە كە تەنها چەند كەسێك بیبەن بەڕێوە. (٢) وڵاتێكە كە ڕژێمێكی وەهای هەبێت. (٣) ئەو دەستە كەسەی ئەم ڕژێمە بەڕێوەدەبەن.

**-oligarchic; oligarchical** *(adj.).*

**oligo-, olig-** (ol′i-gō), پێشگرێكە بەمانای: كەم؛ چەند؛ بچووك؛ كەمی؛ ناتەواوی

**oligopoly** (ol′i-gop′ə-li), *n.* قۆرخ كردنی بازار لەلایەن چەند كەسێك یا كۆمپانیایەكەوە

**olio** (ō′li-ō), *n.* (١) شلەی گۆشت و سەوزە. (٢) شتی جۆراوجۆر؛ شتی هەڕەمە یا تێكەڵاو.

**olivaceous** (ol′i-vā′shəs), *adj.* ڕەنگ زەیتونی

**olivary** (ol′ə-ver′i), *adj.* شێوە زەیتونی

**olive** (ol′iv), *n.* (١) دار زەیتون (٢) زەیتون (٣) داری دار زەیتون. (٤) چڵە زەیتون؛ گوڵبەندی زەیتون؛ گەردانەی زەیتون (٥) سەوزی زەیتونی؛ زەیتونی

*adj.* (١) زەیتونی؛ هی زەیتون (٢) ڕەنگ زەیتونی؛ زەیتون ڕەنگ؛ زەیتونی.

**olive branch,** (١) چڵە زەیتون (نیشانەی ئاشتی). (٢) پێشكەشی ئاشتی؛ پێشكەشكەری ئاشتی؛ پێشنیازی ئاشتی.

**olive drab,** (١) سەوزی تۆخ؛ سەوزی بۆركار (٢) قوماشی خوری ئەم ڕەنگە (جلی سەربازی لێ دروست دەكرێت). (٣) (*pl.*) جل وبەرگی ئەم ڕەنگە.

**olive green,** سەوزی زەیتونی

**olive oil,** ڕۆن زەیتون

**Olympiad** (ō-lim′pi-ad′, ə-lim′pi-ad′), *n.* (١) ماوەی چوار ساڵی نێوان یارییە ئۆلەمپییەكانی یۆنانی كۆن (٢) یاری ئۆلەمپی نوێ.

**Olympian** (ō-lim′pi-ən, ə-lim′pi-ən), *n.* (١) یەكێك لەو دوانزە خوایەی كە گوایە لە قەدپاڵی شاخی " ئۆلیمپەس " لە یۆنان ژیاون (ئەفسانەی یۆنانی) (٢) نیشتەجێیەكی دەشتی " ئۆلیمپیا " ی یۆنانی (كە یاری ئۆلەمپی لێوە دەستپێكرا) (٣) وەرزشكارێكی یاری ئۆلەمپی

*adj.* (١) هی دەشتی " ئۆلیمپیا " یا شاخی " ئۆلیمپەس " . (٢) مەزن؛ خودایی؛ بەرز؛ گەورە. (٣) هی یاری ئۆلەمپی كۆنی یۆنان.

**Olympic** (ō-lim′pik, ə-lim′pik), *adj.* = Olympian.

*n.* (١) یارییەكی ئۆلەمپی. (٢) (*pl.*) (the ~) یاری ئۆلەمپی

**Olympic games,** (١) یاری ئۆلەمپی كۆنی یۆنان (٢) یاری ئۆلەمپی

**-oma** (ō′mə), پاشگرێكە بەمانای: سندان (شێرپەنجە)؛ برین

**omasum** (ō-mā′səm), *n.* گەدەی سێهەمی گیانداری كاوێژكەر.

**omega** (ō-meg′ə, ō-mē′gə, ō′mi-gə), *n.* (١) دواهەمین تیپی ئەلف وبێی یۆنانی (كە بیست و چوار تیپە). (٢) دوا؛ كۆتایی؛ دواهەمین؛ دوایی

**omelet, omelette** (om′lit, om′ə-let), *n.* خواردەمەنییەكە بریتییە لە هێلكەی شلەقاو و پەنیرو سەوزەی وەك قارچك و بیبەرو پەتاتەی سوورەوەكراو پێكەوە

**omen** (ō′mən), *n.* نیشانەی دواڕۆژ (هی بهات یا نەهات)؛ نوقڵانە (باش یا خراپ): | *It is a bad* ( or *good* ) ~ . | .

*v.t.* نوقڵانەلێدان؛ پێشبینی كردن؛ واگەیاندن؛ نیشانەی ئەوەبوون.

**ominous** (om′ə-nəs), *adj.* بەدووم؛ نیشانەی ڕوودانێكی خراپ؛ ترسناك: *( an ~ sign)* .

-ominously *(adv.).*

**omissible** (ō-mis′ə-b′l), *adj.* بۆی هەیە لابرێ یا ببوێررێ

**omission** (ō-mish′ən), *n.* (١) لابردن؛ بواردن (٢) شتێكی لابراو یا بوێرراو (٣) شتێكی پەرێنراو، نەكراو، یا خراوە پشت گوێ

**omit** (ō-mit′), *v.t.* (١) لابردن؛ بواردن. *( to ~ a sentence, paragraph, etc.)* (٢) خستنە پشت گوێ؛ فەرامۆش كردن؛ نەكردن: *( She ~ted to bathe.)* .

**omni-** (om′ni, om′nə), پێشگرێكە بەمانای: هەموو؛ لە هەموو شوێن: *( omniscient)*

**omnibus** (om′ni-bus′, om′nə-bəs), *n.* (١) پاسی دوو نهۆم؛ پاسی ناوشار؛ پاس. (٢) پەرتووكێكە گەلێك لە بەرهەمە جۆراوجۆرەكانی نووسەرێكی تێدا كۆكراوەتەوە یا بەرهەمی هاوچەشنی چەند نووسەرێك.

*adj.* گشتی؛ گشتگرەوە؛ فرە مەبەست؛ گەلێك شتی تێدایە یا پێ دەكرێ. *( an ~ law, tool, volume, etc.)*

**omnifarious** (om′ni-fâr′i-əs), *adj.* جۆراوجۆر؛ هەمە چەشن؛ فرە جۆر.

**omnific** (om-nif′ik), *adj.* هەموو شت دروستكەر (خودا)؛ كردگار.

**omnipotence** (om-nip′ə-təns), *n.* (١) توانای بێ سنوور؛ توانای تەواو؛ دەسەڵاتی بێ ئەندازە. (٢) [O-]، خودا.

**omnipotent** (om-nip′ə-tənt), *adj.* تواناداری بێ ئەندازە؛ زۆر بەدەسەڵات؛ توانای بەسەر هەمووشتێكدا دەشكێت: *( God is ~ .)*

**the Omnipotent,** خودا؛ یەزدان.

**omnipresence** (om′ni-prez′′ns), *n.* لە هەمووشوێنێك بوون لە هەمان كاتدا.

**omnipresent** (om′ni-prez′′nt), *adj.* لە هەمووشوێنێكدایە لە هەمان كاتدا.

**omniscience** (om-nish′əns), *n.* (١) هەموو شت زانین؛ ئاگا لە هەموو شت بوون؛ بە هەموو شت زانین؛ زانینی تەواو. (٢) [O-]، خودا؛ یەزدان.

**omniscient** (om-nish′ənt), *adj.* هەموو شت زان؛ بزان؛ بە هەموو شت زان؛ ئاگاداری تەواوی هەموو شت.

**the Omniscient,** خودا؛ یەزدان.

**omnium-gatherum** (om′ni-əm-gath′ẽr-əm), *n.* [L.], كۆمەڵێكی جۆراوجۆر؛ چێشتی مجەور

**omnivore** (om-niv′ẽr), *n.* گیانداری هەموو شت خۆر (گۆشتیش و سەوزەیش و میوەیش).

**omnivorous** (om-niv′ẽr-əs), *adj.* (١) هەموو شت خۆر؛ گۆشتیش دەخوات و سەوزەیش دەخوات: *( Man is ~ .)* . (٢) هەمووشتێك دەماشێتەوە بەبێ جیاوازی؛ تێرنەخۆر (مەجاز)؛ بە پەلە هەمووشتێك هەڵدەلووشێ (مەجاز): *( an ~ reader)* .

**on** (on, ôn), *prep.* (١) لەسەر؛ لەبان: *( The cup is ~ the table.)* . (٢) لە نزیك؛ بەتەنیشت؛ لەلایەوە: *( a cottage ~ the lake; seated ~ my right)* (٣) لە (كات)؛ لەكاتی:

*( ~ entering the room; ~ the first of the month)*
(٤) بە بەپێی: پشت بە: *( ~ his authority; ~ purpose)*.
(٥) خەریك لە *( ~ a trip)*
(٦) لە بارێكی تایبەتیدا؛ لە: *( ~ parole)*
(٧) لە ئەنجامی شتێكدا؛ لە: لێ *( He made a profit ~ the sale.)*.
(٨) بە *( to live ~ bread and water)*
(٩) لە بابەت؛ دەربارەی *( He wrote an essay ~ war.)*.
(١٠) لەسەر حسابی: *( a drink ~ me; a beer ~ the house)*.
*adv.* (١) لە (لەپێكردن، لەبەركردن، لەسەركردن): *( Put your shoes ~ .)*.
(٢) بۆ پێشەوە *( Move ~ .)*
(٣) بەردەوام بوون؛ لەسەر ڕۆیشتن: *( She sang ~ .)*
(٤) داگیرساندن: هەڵكردن؛ كردنەوە (رادیۆ، تەلەفزیۆن):
*( to turn ~ the light, radio, television, etc.)*
*adj.* (١) كراوەتەوە (رادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ داگیرساوە؛ كاردەكات:
*| The light ( radio, television, engine ) is ~ . |*
(٢) دەستی پێكردووە؛ بەردەوامە: *( The play is ~ .)*.
**and so on,** وە هەروەها
**have something on one,** [Colloq.]. بەڵگەی نهێنی خراپ هەبوون لەسەر: شتی خراپ هەبوون لەسەر: *( She has something on him.)*.
**on and off,** ناوبەناو: جار نە جار؛ جار بە جار.
**on and on,** بەردەوام: بەبێ وەستان
**on to,** [Slang]. ئاگادار

**onager** (on′ə-jẽr), *n.* (١) كەرەكێوی (٢) مەنجەنیق

**onanism** (ō′nən-iz′m), *n.* (١) خۆكێشانەوە پێش ئاوهاتنەوە بۆ سكپڕ نەبوون. (٢) دەستپەڕ؛ ئاوی خۆ هێنانەوە

**once** (wuns), *adv.* (١) جارێك: یەك جار: *( ~ a day)*.
(٢) ڕۆژێك لە ڕۆژان؛ ئەگەر بۆ جارێكیش بێت:
*( O~ known, never forgotten)*
(٣) ڕابوردوو؛ پێشوو؛ جاران *( She was ~ a famous actress.)*.
*conj.* هەر كە؛ كە: یەكسەر كە: كاتێك كە.
*( O~ he is tired he will quit.)*
*adj.* هی پێشوو: هی جاران *( the ~ capital of the nation)*.
*n.* جارێك: یەك جار: جار. *( Let him go this ~ . ; I'm right for ~ .)*.
**all at once,** (١) هەموو پێكەوە: پێكەوە. (٢) كوتوپڕ.
**at once,** (١) یەكسەر؛ دەستبەجێ؛ دەمودەست. (٢) لە هەمان كاتدا.
**for once,** تەنها جارێك: هیچ نەبێت جارێك
**once and again,** جار لەدوای جار: گەلێك جار.
**once and for all,** بە یەكجاری: بە تەواوی.
**once in a while,** جار بە جارێك؛ جار نە جارێك؛ ناوبەناو.
**once upon a time,** وا دەگێڕنەوە كە لە زەمانی كۆندا؛ هەبوو نەبوو.

**once-over** (wuns′ō′vẽr), *n.* [Slang]. سەیركردنێكی سەرپێیی و هەڵسەنگاندن

**oncology** (oŋ-kol′ə-ji), *n.* زانستی شێرپەنجە؛ شێرپەنجەناسی (پزیشكەوانی).

**oncoming** (on′kum′iŋ), *adj.* ئەوەی وا دێت بەرەو ئێرە؛ نزیك بووەوە *( the ~ storm)*
*n.* نزیك بوونەوە؛ هاتن بەرەو.

**one** (wun), *adj.* (١) یەك: یەكێك: تاكێك.
(٢) پێكەوە: یەك: *( with ~ voice)*
(٣) یەك *( from ~ end of town to another)*.
(٤) یەكێكی دیاری نەكراو: *( ~ day last week)*.
(٥) هەمان
*n.* (١) یەك (٢) یەك كەس یا شت.
*pron.* (١) یەكێك: دانەیەك:
*( I don't like this hat. Can you show me a better ~ ? )*
(٢) كەسێك یا شتێك؛ مرۆڤ؛ یەكێك: *( O~ has to do one's best.; If ~ wants a thing done, ~ had best do it oneself.)*
**all one,** هەمووی وەك یەك وایە.
**at one,** ڕێككەوتوون؛ یەكن؛ لەسەر یەك ڕان
**one and all,** هەمووكەس؛ هەمووكەسێك.
**one another,** یەكتر؛ یەكتری:
*( They love and respect one another.)*
**one by one,** یەك لەدوای یەك؛ یەك بە یەك؛ یەكە یەكە.

**one-horse** (wun′hôrs′), *adj.* (١) یەك ئەسپ ڕای دەكێشێ؛ یەك ئەسپی. (٢) بچووك؛ ناگرنگ: *( a ~ town)*.

**oneness** (wun′nis), *n.* (١) تەنهایی؛ بێ هاوبەشی: *( the ~ of God)*
(٢) یەكتایی؛ بێ هاوتایی. (٣) یەكێتی؛ یەك پارچەیی.
(٤) گونجان؛ سازان. (٥) لەیەكچوون؛ چوونیەكی؛ یەك ئەوایی.

**one-night stand** (wun′nīt′), نواندنێكی یەك شەوی (تیپی شانۆگەری یا مۆسیقای گەڕۆك).

**onerous** (on′ẽr-əs), *adj.* گران؛ قورس: *( ~ duties)*.

**oneself** (wun′self′, wunz′self′), *pron.* خۆ.
**be oneself,** خۆ لێ نەگۆڕان.
**by oneself,** بە تەنها؛ بە تاقی تەنیا!.
**come to oneself,** هۆش هاتنەوەبەر خۆ.

**one-sided** (wun′sīd′id), *adj.* (١) یەكلایی؛ یەكلا: *( a ~ street)*.
(٢) لاسەنگ. (٣) لایەنگر؛ سەر بە لایەكە؛ لە یەك لاوە:
*( a ~ view of the issue)*

**one-time** (wun′tīm′), *adj.* پێشوو؛ جاران: *( a ~ teacher)*.

**one-track** (wun′trak′), *adj.* (١) یەك هێڵ.
(٢) [Colloq.]، هەر خولیای یەك شتە؛ هەر بیر لە یەك شت دەكاتەوە؛ تەسك:
*( a ~ mind)*

**one-way** (wun′wā′), *adj.* یەك سەری (شەقام، بلیتی گەشت... هتد)؛ یەك سەرە: *( a ~ street, ticket, etc.)*.

**onion** (un′yən), *n.* پیاز.

**onion-skin** (un′yən-skin′), *n.* (١) توێكلە پیاز.
(٢) جۆرە كاغەزێكی تەنكی ڕۆشنی قایمە.

**onlooker** (on′look′ẽr), *n.* تەماشاكەر؛ سەیركەر.

**only** (ōn′li), *adj.* (١) تەنها؛ تەنیا. (٢) باشترین؛ نایابترین.
*adv.* هەر؛ تەنها.
*conj.* [Colloq.], بەڵام؛ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە:
*( I would have gone, ~ it rained.)*
**if only,** خۆزگە: *( If only I could see you again! )*.
**one and only,** تەنها: *( my one and only chance)*.
**only too,** زۆر: *( only too gald to help)*.

**onomatopoeia** (on′ə-mat′ə-pē′ə), *n.* (١) پێكهێنانی وشەیەك كە بە دەنگەكەیدا ماناكەی دیارە (وەك: تەق‌وتووق، شلپە، گرمە گرم، زیقە زیق، ووزە ووز): ( **buzz, hum, splash, etc.**).
(٢) ووشەیەكی وەها.
(٣) بەكارهێنانی ووشەی وەها.
-**onomatopoeic** *(adj.).*

**onrush** (on′rush′), *n.* لێشاو؛ تەووژم.

**onset** (on′set′), *n.* (١) هێرش؛ تاو؛ هەڵمەت.
(٢) سەرەتا: *( the ~ of a cold)*.

**on-shore** (on′shôr′, on′shōr′), *adj.* (١) لە كەناری دەریا: *( an ~ gale)*
(٢) لەسەر كەناری دەریا؛ لەسەر ووشكانی: *( an ~ patrol)*.
*adv.* لە كەناری دەریا؛ لەسەر ووشكانی.

**onslaught** (on′slôt′), *n.* هێرشێكی دڕندانە.

**onto** (on′tōō, on′tə), *prep.* (١) بەرەو وە لەسەر؛ لەسەر
(٢) [Slang] ئاگادار: ***( The boss is ~ you and your excuses.)*** .
**onto-** (on′tō, on′tə), پێشگرێکە بەمانای: بوونەوەری؛ بوون:
***( ontology)***
**ontogeny** (on-toj′ə-ni), *n.* گۆڕانی زیندەوەر
**ontology** (on-tol′ə-ji), *n.* زانستی بوون: زانستی بوونەوەری.
**-ontological** *(adj.)*; **ontologist** *(n.)*.
**onus** (ō′nəs), *n.* ئەرکی کران: بار: پێویستی سەرشان.
***( The ~ of proof rests with you.)***
**onward** (on′wẽrd), *adv.* بۆ پێشەوە (شوێن، کات).
***( to move ~ )***
***adj.*** بۆ پێشەوە: بەرەو پێشەوە: ***( an ~ march)*** .
**onwards** (on′wẽrdz), *adv.* = **onward.**
**onyx** (on′iks, ō′niks), *n.* یاقیقی یەمەنی؛ بەردی سلێمان.
**oo-** (ō′ə), پێشگرێکە بەمانای: هێلکە: هێلکۆکە.
**oocyte** (ō′ə-sīt′), *n.* هێلکەی نەبەکام (زیندەوەرزانی).
**oodles** (ōō′d'lz), *n.pl.* [Slang], فرە زۆر نێجکار زۆر؛ زۆر:
***( ~ of money)***
**oology** (ō-ol′ə-ji), *n.* زانستی هێلکەی باڵندە.
**oolong** (ōō′lôŋ, ōō′loŋ), *n.* جۆرە چایەکی چینییە.
**oomph** (oomf), *n.* [Slang], (١) دڵفرێنی ژن یا پیاو؛
هەوەس هەڵسێن. (٢) تین؛ ووزە؛ چالاکی؛ گورج وگۆڵی.
**oops** (oops), *interj.* = **whoops; woops.**
**ooze** (ōōz), *n.* (١) ئاودزن؛ ئاودادان؛ دەڵاندن؛ ئاوەزێ.
(٢) شتێکی ئاودزکردوو؛ شتێك کە بیدەڵێنێ.
(٣) ئاوکی جەوت (بۆ پێستە خۆشکردن).
***v.i.*** (١) دەڵاندن: ئاودادان؛ ئاوتێزان؛ خوێن تێزان:
***( My shoes were ~ing with water.)***
(٢) بەرە بەرە نەمان: ***( His desire to go ~d away.)*** .
(٣) لێوە هاتنەدەرەوە؛ پڕ لە: ***( a woman ~ing with charm)*** .
***v.t.*** دانەوە؛ لێ هاتنەدەرەوە.
**ooze** (ōōz), *n.* (١) قوڕولیتە (بەتایبەتی هی بن ئەستێل، دەریاچە، زەریا).
(٢) رەلکاو؛ زۆنگاو؛ زۆنگ.
**oozy** (ōō′zi), *adj.* ئاودەلێر؛ ئاو یا خوێن لێ تکاو؛ خوێن تێزاو
**oozy** (ōō′zi), *adj.* لینج؛ لیتاوی
**opacity** (ō-pas′ə-ti), *n.* (١) تاریکی؛ ڕووناکی لێوە نەهاتن.
(٢) شتێکی ناڕۆشن یا ڕووناکی لێوە نەهاتوو.
**opah** (ō′pə), *n.* ماسییەکی دەریایی گەورەی ڕەنگاوڕەنگە.
**opal** (ō′p'l), *n.* بەردێکی بەنرخی ڕۆشنی هەمەڕەنگە.
**opaline** (ō′p'l-in, ō′p'l-in′), *adj.* ڕۆشن: درەوشاوە؛ ڕەنگین.
**opaque** (ō-pāk′, ə-pāk′), *adj.* (١) ڕووناکی لێوە نایەت؛ تاریك؛
تەنخ: ***( ~ glass)*** .
(٢) نەدرەوشاوە. (٣) ئەلەکتریك یا گەرما نەگەیێنێ.
(٤) ناڕوون (باس)؛ لێڵ؛ تێگەیشتنی گرانە.
(٥) بێ مێشك؛ کەودەن؛ کەر.
***n.*** (١) شتێکی ناڕۆشن یا تاریك.
(٢) شلەیەکە بۆ داپۆشینی بەشێکی جام (وێنەگری).
**op. cit.**, [L.], لە هەمان سەرچاوەی ناوبراودا (پەراوێز).
**open** (ō′p'n), *adj.* (١) کراوە ***( an ~ door)*** .
(٢) بەرەڵا؛ بەر بەرەڵا ***( an ~ field)*** .
(٣) کراوە؛ دانەخراو؛ نەپێچراوە.
(٤) سەربەرەڵا؛ سەربەتاڵ؛ کراوە: ***( an ~ can, jar, bottle, etc.)*** .
(٥) نەپارێزراو؛ بەرەڵا.
(٦) کراوە ***( an ~ book)*** .
(٧) یەك نەگرتوو؛ ناکۆك؛ ناڕێك: ***( ~ ranks)*** .
٨) کراوە؛ سەهۆڵ نەگرتوو؛ نەیبەستووە.
٩) کراوەیە بۆ هەمووکەس ***( an ~ meeting or tournament)***
١٠) نەبڕاوەتەوە؛ نەخراوە بە لایەکدا: ***( an ~ question)***
١١) کراوە: فراوان: ***( an ~ mind)***
ب) دەست ودڵ کراوە.
١٢) کراوەیە؛ لە کاردایە: ***( an ~ account)***
١٣) نەگیراو؛ کراوە: ***( The job is still ~ .)*** .
١٤) کراوەتەوە: ***( The store is ~ .)*** .
١٥) ئاشکرا: زانراو؛ لەبەرچاو: ***( an ~ quarrel)*** .
١٦) لەڕوو؛ قسە لەڕوو؛ ڕووکراوە: ***( an ~ person, manner, etc.)***
١٧) ڕوون؛ سایەقە
١٨) أ) بەکراوەیی بێژراو (تیپە بزوێن).
ب) بە تیپە بزوێن دواهاتوو (بڕگە).
***v.t.*** ١) کردنەوە. ***( O~ the door, please.)*** .
٢) کردنەوە: ***( to ~ a road through the mountain)***
٣) کردنەوە. ***( He ~ed the book.)*** .
٤) دەرگا کردنەوە بۆ هەمووکەس (ئەندامێتی)
٥) دەستپێکردن؛ کردنەوە (کۆڕ): ***( to ~ a conference)***
٦) کردنەوە؛ سەر هەڵپچڕین: ***( to ~ a bottle, can, etc.)***
٧) دانان (فرۆشگا، یانە... هتد)؛ کردنەوە: ***( He ~ed a new store.)***
٨) داچەقاندن.
٩) هەڵهێنان (چاو).
***v.i.*** (١) کرانەوە: ***( The flowers are ~ing.; The door ~ed. )*** .
(٢) دەرکەوتن؛ هاتنە بەرچاو.
(٣) کرانەوە؛ مێشك.
(٤) دەستپێکردن؛ کرانەوە: ***( When does the school ~ again?;***
***The story ~s with a terrible murder.; The play ~s next week.)***
(٥) (**onto ~** )، کرانەوەو ڕوانین بەسەردا:
***( The door ~s onto a lovely garden.)***
**open fire,** تەقەلێکردن؛ گوللە پێوەنان
**open out,** (١) کرانەوە؛ کشان. (٢) دەرکەوتن؛ هاتنە بەرچاو.
**open to,** (١) کراوەیە بۆ: ئامادەیە بۆ باسکردن؛ ئارەزوومەند:
***( We are open to suggestions.)***
(٢) بۆی هەیە؛ لەوانەیە؛ دەیگرێتەوە:
***( This tactic is open to criticism.)***
(٣) هەیە (هەل، کار)؛ کراوەتەوە بۆ:
***( The job is open to both men and women candidates.)***
**open up,** (١) کردنەوە؛ کرانەوە. (٢) ڕاخستن.
(٣) دەستپێکردن؛ کردنەوە؛ کرانەوە
(٤) [Colloq.]، ڕووکرانەوە؛ زمان کرانەوە؛ جڵەو بۆ خۆ بەردان و
قسەکردن لەڕوو یا ڕەفتار نوواندن:
***( The guests opened up after a while.)***
**the open,** (١) شوێنێکی تەخت و پان و کراوە (لەسەر ووشکانی یا
لە دەریادا). (٢) دەشت ودەر؛ دەرەوە.
(٣) هەمووکەس دەیزانێ:
***( Their secrets are all in the open now.)***
(٤) [O-]، پێشبڕکێیەکی کراوە بۆ هەمووکەس.
**open-air** (ō′p'n-âr′), *adj.* = **outdoor.**
**open air,** دەرەوەی مال؛ دەرەوە؛ دەشت ودەر.
**open-and-shut** (ō′p'n-'n-shut′), *adj.* ئاسان: ***( an ~ case)*** .
**open-door** (ō′p'n-dôr′, ō′p'n-dōr′), *adj.* بێ قەدەغە؛
دەرگا کراوەتەوە بۆ وەرگرتنی هەمووکەس یا هەموو وولاتێك:
***( an ~ policy of admission to schools)***
**open door,** (١) وەرگرتنی بێ قەدەغە؛ دەرگای کراوە بۆ وەرگرتنی
هەمووکەس یا وولاتێك. (٢) سەربەستی بازرگانی لەگەڵ وولاتێك لەلایەن هەموو

وولاتانەوە بەبێ مەرج.

**open-ended** (ō′p'n-end′id), *adj.* (١) بێ سنوور

(٢) دەتوانرێ بگۆڕێ بەگوێرەی پێویستی *( an ~ plan)*

(٣) نەبڕاوەتەوە: نەخراوە بە لایەکدا.

**opener** (ō′p'n-ēr), *n.* (١) مەکینەی قوتوو هەڵپچڕین:

*( a can- ~ )*

(٢) پەردەی یەکەم (شانۆنامە، نواندنی قۆشمە).

(٣) یەکەم بڕی.

**open-eyed** (ō′p'n-id′), *adj.* (١) چاوکراوە؛ ووریا.

(٢) بە ووریایی کراو.

**open-handed** (ō′p'n-han′did), *adj.* بەخشندە؛ بەرچاوتێر.

**open-hearted** (ō′p'n-här′tid), *adj.* (١) قسە لەڕوو؛ کراوە؛ لەڕوو

(٢) دڵنەرم؛ بەخشندە؛ دڵ فراوان؛ دڵکراوە.

**open house,** (١) میوانداری‌یەکی گشتی یا کراوە بۆ هەمووکەس.

(٢) کردنەوەی شوێنێکی وەك قوتابخانە بۆ میوان بەتایبەتی باوك و دایکی قوتابی، یا دەزگایەکی تر بۆ ئەوانەی دەیانەوێ بیبینن.

(٣) دەرگاکردنەوەی خانوویەك کە لەناو بازاڕدا بێت بۆ فرۆشتن بۆئەوەی کڕیاران بیبینن

**opening** (ō′p'n-iŋ), *n.* (١) (ا) کردنەوە (ب) کرانەوە

(٢) کون؛ کەلەبەر؛ دەرگا؛ کەلێن؛ دەم.

(٣) ڕووتەنی ناو دارستانێك

(٤) (ا) سەرەتا؛ دەستپێکردن

(ب) کرانەوە؛ کردنەوە: *( the ~ of a project)*

(٥) هەل *( as soon as there is an ~ )*.

(٦) جێگەیەکی بەتاڵ لە فەرمانگەیەك یا دەزگایەکدا بۆ کارکردن:

*( There is an ~ for a clerk in my department.)*

**open letter,** نامەیەکی کراوە؛ نامەیەکی ڕەخنەو سکاڵایە بۆ کاربەدەستێك یا ئەنجوومەنێك بەڵام لە ڕۆژنامەدا بڵاودەکرێتەوە

**open-minded** (ō′p'n-mīn′did), *adj.* مێشك کراوە؛ گوێ ڕاگر لە بیروڕاو بەڵگەی نوێ

**-open-mindedly** *(adv.)*; **open-mindedness** *(n.)*.

**openly** (ō′p'n-li), *adv.* بە ئاشکرا؛ بێ پێچ‌وپەنا؛ لەڕوو.

**open-mouthed** (ō′p'n-mouthd′), *adj.* (١) دەم کراوە

(٢) واق وڕماو؛ دەم داچەقاو (سەرسامی) (٣) دەم پان

**openness** (ō′p'n-nis), *n.* (١) ئاشکرایی؛ شت نەشاردنەوە

(٢) قسەلەڕوویی (٣) هەمووکەس وەك یەك تەماشاکردن.

**open season,** وەرزی ڕاوکردن (بە مۆڵەتی میری).

**open secret,** نهێنی‌یەکی گشت کەس پێ زانیو؛ نهێنی ئاشکرا

**open sesame,** هۆی سەرکەوتن یا بە ئامانج گەیشتنی مسۆگەر

**open shop,** کارگەی کراوە؛ دەزگایەکە ئەندامی یەکێتی و نائەندامیش بەکرێ دەگرێت

**opera** (op′ēr-ə), *n.* (١) ئۆپەرا؛ چیرۆکێکی شانۆگەری‌یە بە گۆرانی و مۆسیقاوە دەنوێنرێت. (٢) ئۆپەراخانە

**operable** (op′ēr-ə-b'l), *adj.* (١) چارە دەکرێت بە نەشتەرکاری:

*( an ~ cancer)*

(٢) بەکاردێت؛ ئیش دەکات؛ کاری پێ دەکرێت: *( an ~ motor)*.

(٣) کردەنی *( an ~ plan)*

**opera house,** خانەی ئۆپەرا؛ شانۆی ئۆپەرا.

**operate** (op′ə-rāt′), *v.i.* (١) کەوتنەگەڕ؛ ئیش کردن (مەکینە)؛ کارکردن (٢) کارتێکردن؛ بە ئەنجام گەیاندن.

(٣) ( ~ **against** ). هێرش بردنە سەر؛ لەشکرلێکردن.

(٤) نەشتەرکاری کردن؛ نەشتەرگەری کردن

*v.t.* (١) خستنەگەڕ؛ لێخوڕین (ئوتومبیل، تراکتۆر)؛ ئیش پێکردن

(٢) بەڕێوەبردن *( to ~ a restaurant)*

**operation** (op′ə-rā′shən), *n.* (١) کارکردن؛ کارپێکردن

(٢) هێز؛ دەسەڵات.

(٣) کردار؛ کار (بەتایبەتی کە ئەڵقەیەك بێت لە زنجیرەیەك کاردا).

(٤) کردارێکی سوپایی.

(٥) نەشتەرکاری.

(٦) ژمارەکاری (ژمارەوپێوان).

**in operation,** کاردەکات؛ لەگەڕدایە؛ لەکارکردندایە:

*( The factory is in operation.)*

**operational** (op′ə-rā′shən-'l), *adj.* (١) تایبەتی بە کردارێك یا کارێك. (٢) تایبەتی بە کرداری سوپایی.

(٣) بەکاردەهێنرێت؛ دەخرێتە کار؛ کاردەکات: *( an ~ aircraft)*.

**operative** (op′ə-rā′tiv, op′ēr-ə-tiv), *adj.* (١) کاردەکات؛ دەخرێتە کار. (٢) کاریگەر (٣) تایبەتی بە نەشتەرکاری‌یەك.

*n.* (١) کرێکاری پیشەسازی؛ کرێکار. (٢) پۆلیسی نهێنی.

**operator** (op′ə-rā′tēr), *n.* (١) کرێکار؛ کارگەر:

*( a telephone ~ )*

(٢) خاوەن کار؛ خاوەن کارگە

(٣) پارەباز.

(٤) نیشانەی ژمارەکاری (کۆکردنەوە، لێ دەکردن... هتد).

(٥) [Colloq.]، کەسێکی زۆڵی زمان لووسی لەخشتەبەر؛ کەسێکە مەبەستی هەرچی‌یەك بێت دەستی دەکەوێت لەڕێی چەوتەوە: *( He is such an ~ .)*

**operculum** (ō-pūr′kyoo-ləm), *n.* (١) قاوغی هەناسەکێشی ماسی.

(٢) چمکی داپۆشەر یا سەرگر (گیانەوەرناسی، ڕووەکناسی).

**operetta** (op′ə-ret′ə), *n.* کورتە ئۆپەرا.

**ophidian** (ō-fid′i-ən), *n.* مار؛ خشۆکی بێ پەل.

*adj.* ماری؛ هی مارو خشۆکی تری بێ پەل.

**ophiology** (of′i-ol′ə-ji), *n.* مارناسی؛ زانستی مار.

**ophite** (of′īt, ō′fīt), *n.* بەردەمار: جۆرە بەردێکی خاڵ خاڵاوی سەوزە.

**ophthalmia** (of-thal′mi-ə), *n.* چاوئێشە؛ چاو گل کردن؛ چاو هەوکردن.

**ophthalmic** (of-thal′mik), *adj.* (١) هی چاو؛ تایبەتی بە چاو.

(٢) چاوئێشەیی

**ophthalmitis** (of′thal-mī′tis), *n.* = **ophthalmia.**

**ophthalmo-, ophthalm-** (of-thal′mə), پێشگرێکە بەمانای: چاو؛ تایبەتی بە چاو: *( ophthalmoscope)*.

**ophthalmologist** (of′thal-mol′ə-jist), *n.* پزیشکی چاو؛ پزیشك و نەشتەرگەری چاو.

**ophthalmology** (of′thal-mol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی چاو.

**-ophthalmological** *(adj.)*.

**ophthalmoscope** (of-thal′mə-skōp′), *n.* بینەری چاو: ئامێرێکە بۆ تێڕوانینی چاو؛ چاوپشکنەر؛ بینەری پزیشك.

**-ophthalmoscopic** *(adj.)*; **ophthalmoscopy** *(n.)*.

**-opia** (ō′pi-ə), پاشگرێکە بەمانای: ناتەواوی چاو؛ کەم‌وکووڕی بینایی:

*( myopia)*

**opiate** (ō′pi-it, ō′pi-āt′), *n.* (١) دەرمانی تلیاکاوی: دەرمانی سڕکەر؛ بەنگ. (٢) شتێکی ئارام پێدەر یا دامرکێنەرەوە.

*adj.* (١) تلیاکاوی؛ تلیاکی تێدایە. (٢) سڕکەر؛ خەولێخەر؛ ئارام پێدەر.

*v.t.* [Rare]. (١) دەرمان کردن بە تلیاك. (٢) سڕکردن؛ مراندن.

**opine** (ō-pīn′), *v.t. & v.i.* وا دانان؛ وا زانین؛ ڕا وا بوون.

**opinion** (ə-pin′yən), *n.* (١) ڕا:

*( public ~ ; In my ~ , he is a fool.)*

(٢) بیروباوەڕ؛ بیروڕا.

(٣) هەڵسەنگاندن؛ ڕای لێکۆڵراوە: *( a legal ~ )*.

(٤) گوفتاری دادپرس؛ فەرمان؛ بڕیار.

**opinionated** (ə-pin′yən-ā′tid), *adj.* ڕای خۆپەرست؛ لە ڕای خۆی نایەتە خوارەوە؛ هەر ڕای خۆی لا پەسەندە؛ کەللەڕەق

**opium** (ō′pi-əm), *n.* تلیاك؛ بەنگ

**opium poppy,** خەشخاش ڕووەکی بەنگ؛ ڕووەکی تلیاك.

**opossum** (ə-pos′əm), *n. Also* **possum,** گیاندارێکی ئەمەریکایی
شەوگەڕی هەمووشتخۆری شیرداری کلك درێژی داروەرەخت نشینە بەچکەی
لە توورەکەیەکدا هەڵدەگرێ‌و خۆی دەکات بە مردوو کە هێرشی بۆ دەبرێت

**opponent** (ə-pō′nənt), *adj.* (۱) بەرامبەر وەستاو؛ بەرامبەر.
(۲) دژوەستاو؛ دژ؛ ناحەز؛ نەیار.
(۳) ڕێ لێگر (ماسولکە).
*n.* کەسی بەرامبەر وەستاو (کێبەرکێ، مشتومڕ، یاری، شەڕ، کۆڕ)؛ دوژمن؛
ناحەز

**opportune** (op′ẽr-tōōn′, op′ẽr-tūn′), *adj.* (۱) سار؛ گونجاو؛
باش (کات *(at an ~ time)*
(۲) لە کاتی خۆیدا؛ لە کاتێکی باشدا: *(an ~ remark)*.

**opportunism** (op′ẽr-tōōn′iz′m, op′ẽr-tūn′iz′m), *n.* هەل
پەرستی.

**opportunist** (op′ẽr-tōōn′ist, op′ẽr-tūn′ist), *n.* هەل پەرست؛
کەسێکی هەل پەرست
*adj.* هەل پەرست.
-**opportunistic** *(adj.)*.

**opportunity** (op′ẽr-tōō′nə-ti, op′ẽr-tū′nə-ti), *n.* دەرفەت؛
هەل؛ نۆرە؛ مۆڵەت؛ هەلکەوت

**oppose** (ə-pōz′), *v.t.* (۱) دژوەستان؛ بەربەرەکانی کردن؛ بەرهەڵستی
کردن؛ دژایەتی کردن؛ بەرپەرچدانەوە؛ لە ڕوودا وەستان؛ شەڕ لەگەڵ کردن:
*(to ~ the enemy; to ~ the new ideas)*
(۲) بەرامبەرکردن *(to ~ anger with good nature)*.

**be opposed to,** دژ بوون؛ ناقایل؛ نارازی؛ پێ خۆش نەبوون:
*(I am opposed to your going abroad.)*

**opposite** (op′ə-zit), *adj.* (۱) بەرامبەر؛ ئەوی تر (دیو، لا):
*(the house ~ to ours; the ~ side of the street)*
(۲) پێچەوانە: *(in the ~ direction)*.
(۳) دژ بە؛ ناحەز بە؛ ناحەز.
(٤) هاوتا (٥) جووتە (ڕووەکناسی)
*n.* ووشەی پێچەوانە؛ ووشەی دژ مانا: *(Black and white are ~s.)*.
*adv.* بەرامبەر: *(He played ~ her in that film.)*.
*prep.* بەرامبەر؛ ئەوبەر

**opposite number,** کەسێکی هاوپلە لە ڕێکخراوێك، دەزگایەك،
یا وولاتێکی تردا؛ کەسی بەرامبەر.

**opposition** (op′ə-zish′ən), *n.* (۱) بەربەرەکانی؛ بەربەرەکانی کردن.
(۲) ناحەزی؛ دژایەتی؛ دوژمنایەتی. (۳) کۆسپ؛ شتی بەرهەڵستیکەر.
(٤) [O] حیزبی دژوەستاو یا ناحەز؛ بەرەی بەربەرەکانی:
*(the O~ party; the O~ ; leader of the O~ )*
(٥) بەرامبەری (ئەستێرەناسی)

**oppress** (ə-pres′), *v.t.* (۱) دڵگرتن؛ پەستکردن؛ بوون بە بارێکی قورس
بەسەرەوە (۲) چەوساندنەوە؛ ستەمکاری کردن؛ زوڵم‌و زۆرلێکردن.
(۳) [Obs.] (أ) پێشێل کردن؛ پێپەستکردن؛ پلیشاندنەوە.
(ب) بەسەردا زاڵبوون.

**oppression** (ə-presh′ən), *n.* (۱) زوڵم‌و زۆر؛ ستەمکاری؛ زۆرداری؛
زۆرلێکردن؛ چەوساندنەوە. (۲) کارێکی ستەمکارانە یا زۆردارانە.
(۳) دڵگیران؛ پەست بوون؛ پەستی

**oppresive** (ə-pres′iv), *adj.* (۱) چەوسێنەرەوە؛ زۆردار؛ ستەمکار.
*(an ~ regime, king, ruler, etc.)*
(۲) ناڕەوا؛ ناهەموار؛ ناهەق: *(~ laws, taxes, rules, etc.)*.
(۳) دڵگر؛ هەناسە لێ بڕ؛ ناخۆش؛ تەنگ (دەوروبەر، هەوا):
*(an ~ atmosphere, air; ~ weather, heat)*
-**oppresively** *(adv.)*; **oppresiveness** *(n.)*.

**oppressor** (ə-pres′ẽr), *n.* زۆردار؛ زاڵم؛ چەوسێنەرەوە؛ ستەمکار.

**opprobrious** (ə-prō′bri-əs), *adj.* (۱) ناشرین (ووتە، ڕەووشت)؛
ڕووشکێن؛ ڕیسواکەر؛ سووککەر؛ سووک: *(~ words)*.
(۲) مایەی ڕووڕەشی‌یە؛ ناشرین؛ بێ شەرمانە؛ شوورەیی: *(~ behavior)*

**opprobrium** (ə-prō′bri-əm), *n.* (۱) شوورەیی؛ حەیاچوون؛
ڕیسوایی. (۲) کارێکی حەیابەرە؛ کردەوەیەکی ڕیسواکەر.

**oppugn** (ə-pūn′), *v.t.* بەرپەرچدانەوە؛ بەڵگەهێنانەوە دژی؛
ڕەخنەلێگرتن.

**opt** (opt), *v.i.* هەڵبژاردن:
*(The people ~ed for independence.)*

**optic** (op′tik), *adj.* هی چاو؛ هی بینین یا بینایی
*n.* [Colloq.], چاو.

**optical** (op′ti-k'l), *adj.* (۱) هی چاو؛ هی بینایی.
(۲) هی بیناییزانی؛ هی زانستی ڕووناکی‌و بینین.
(۳) هی بینینە؛ یارمەتی بینین دەدات.

**optician** (op-tish′ən), *n.* چاویلکەساز؛ چاویلکەچی

**optics** (op′tiks), *n.pl.* بیناییزانی؛ زانستی ڕووناکی‌و بینین.

**optimism** (op′tə-miz′m), *n.* خۆش بینی؛ خۆش بینین؛ گەشبینی؛
باش بینی.

**optimist** (op′tə-mist), *n.* خۆش بین؛ بەرچاو ڕووناك؛ باش بین.

**optimistic** (op′tə-mis′tik), *adj.* خۆش بین؛ باش بین.
*(I remain ~ about the future.)*
-**optimistically** *(adv.)*.

**optimize** (op′tə-mīz′), *v.t.* گەورەترین سوود لێ وەرگرتن؛
زۆر بە باشی بەکارهێنان.

**optimum** (op′tə-məm), *n.* باشترین (دۆخ، پلە، سوود، هەند).
*adj.* باشترین؛ چاکترین:
*(the ~ temperature for growing vegetables)*

**option** (op′shən), *n.* (۱) هەڵبژاردن؛ مافی ویستن یا هەڵبژاردن؛
ئارەزوومەندی: *(I have no ~ but to go.)*
(۲) شتێکی هەڵبژێراو؛ ئەوەی دەشێت هەڵبژێرێت
*(None of the ~s is satisfactory.)*
(۳) مافی کڕین یا فرۆشتنی شتێك لە ماوەیەکی تایبەتیدا:
*(I have an ~ on a piece of land.)*

**optional** (op′shən-'l), *adj.* بە کەیفی خۆیە؛ بە ئارەزوو یا ویستی
خۆیە: *(Taking the test is ~.)*.

**optometer** (op-tom′ə-tẽr), *n.* پێوەری بینایی؛ ئامێری پێوانی
مەودای بینین.

**optometrist** (op-tom′ə-trist), *n.* پسپۆری بینایی‌و چاویلکە؛
پزیشکی چاو؛ چاویلکەساز.

**optometry** (op-tom′ə-tri), *n.* (۱) پێوانی مەودای بینایی؛ پێوانی
دوورو نزیکی بینین. (۲) تێڕوانینی چاو بۆ ناتەواوی‌و چاویلکە بۆ هەڵبژاردنی

**opulence** (op′yoo-ləns), *n.* (۱) سامان؛ زەنگینی؛ دەوڵەمەندی
(۲) زۆرو زەبەنەیی.

**opulency** (op′yoo-lən-si), *n.* = **opulence.**

**opulent** (op′yoo-lənt), *adj.* (۱) دەوڵەمەند؛ زەنگین.
(۲) زۆرو زەبەنە: *(~ vegetation)*.

**opuntia** (ō-pun′shi-ə), *n.* هەنجیری دڕکاوی؛ هەرمێی دڕکاوی؛
ڕووەکێکی بیابانە.

**opus** (ō′pəs), *n.* (۱) پارچەیەك مۆسیقا.
(۲) بەرهەمێکی وێژەیی (چیرۆك، هۆنراوە، شانۆگەری)

**opuscule** (ō-pus′kūl), *n.* پارچە مۆسیقایەکی کورت‌و هیچ‌وپووچ

**or** (ôr), *conj.* (۱) یا؛ یان: *(I'll offer her tea ~ coffee.)*.
(۲) یا (لە دوو شت زیاتر): *(apples, pears, peaches, ~ plums)*
(۳) واتە؛ یان؛ یا: *(botany, ~ the science of plants)*.

(٤) یا؛ یان یاوەکو
*( Either go ~ stay.; whether he stays ~ goes.)*
***adj.*** زێری؛ زەرد.
**-or** (ēr), پاشگرێکە بەمانای: (١) بکەر: ***( inventor, inspector)*** .
(٢) دۆخ؛ بار: ***( horror, error)***
**oracle** (ôr′ə-k'l, or′i-k'l), ***n.*** (١) پێشبینی پەیامبەر؛ وەلامێکی پێشبینی بوو لە یەکێك لە خوداکانەوە کە پیرێك یا پێغەمبەرێك دەیگەیاندەوە بەو کەسەی پرسیاری بکردایە دەربارەی دواڕۆژ (ئەفسانەی یۆنان‌و ڕۆمان).
(٢) شوێنی پێگەیاندنی ئەم وەلامە.
(٣) پەیامبەری ئەم پەیامە: ***( to consult an ~ )*** .
(٤) (ا) کەسێکی زۆر تێگەیشتوو.
(ب) ئامۆژگاری کەسێکی زۆر تێگەیشتوو.
**oracular** (ô-rak′yoo-lēr, ō-rak′yoo-lēr), ***n.*** (١) تایبەتی بە وەلامو پێشبینی خودایی (ووشەی پێشوو ببینە): ***( an ~ warning)*** .
(٢) دانا؛ زیرەك؛ تێگەیشتوو.
(٣) لێڵ؛ نادیار؛ ناڕوون.
**oral** (ôr′əl, ō′rəl), ***adj.*** (١) بە دەم؛ بە زار
***( ~ instructions)***
(٢) بە دەم وەرگیراو ***( an ~ vaccine)***
(٣) دەم؛ هی دەم ***( ~ hygiene)***
***n.* ( often plural ),** تاقیکردنەوەی زارەکی
**-orally** ***(adv.).***
**oral contraceptive,** حەبی منداڵ نەبوون؛ حەبی سکپڕ نەبوون
**orange** (ôr′ənj, or′inj), ***n.*** (١) پرتەقاڵ. (٢) دارپرتەقاڵ
(٣) ڕەنگی پرتەقاڵی.
***adj.*** (١) تایبەتی بە پرتەقاڵ. (٢) پرتەقاڵی؛ نارنجی.
**orangeade** (ôr′ənj-ād′ or′inj-ād′), ***n.*** ئاوی پرتەقاڵ
**orange pekoe,** جۆرە چایەکی سیلانیە.
**orangery** (ôr′ənj-ri, or′inj-ri), ***n.*** جامخانەی دارپرتەقاڵ: دارپرتەقاڵی تێدا پەروەردە دەکرێ لە ناوچە ساردەکاندا.
**orangewood** (ôr′ənj-wood′, or′inj-wood′), ***n.*** دارپرتەقاڵ
**orangutan, orangoutang** (ō-raŋ′oo-tan′), ***n.*** مەیموونێکە لە مرۆڤ دەچێ لە دارستانەکانی " بۆرنیۆ "و" سۆمەترە " دەژی؛ مرۆڤی کێوی؛ مرۆڤی دارستان
**orate** (ôr′āt, ō-rāt′), ***v.i. & v.t.*** ووتاردان؛ ووتار خوێندنەوە؛ ووتار خوێندنەوە بە کەش‌وفشەوە.
**oration** (ô-rā′shən, ō-rā′shən), ***n.*** ووتار؛ ووتاردان؛ ووتار خوێندنەوە لە ڕێکەوتنێکی ڕەسمیدا.
**orator** (ôr′ə-tēr, or′ə-tēr), ***n.*** (١) ووتاربێژ؛ ووتاردەر
(٢) ووتاربێژی لێهاتوو
**oratorical** (ôr′ə-tôr′i-k'l, or′ə-tō′ri-k'l), ***adj.*** (١) تایبەتی بە ووتاردان یا ووتاربێژ. (٢) حەزکەر لە ووتاردان.
**oratorio** (ôr′ə-tôr′i-ō′, or′ə-tō′ri-ō′), ***n.*** پارچەیەك مۆسیقای ئاینی درێژ
**oratory** (ôr′ə-tôr′i, or′ə-tō′ri), ***n.*** (١) ووتاربێژی؛ ووتاردان؛ هونەری ووتاربێژی. (٢) کڵێسەیەکی تایبەتی بچووك.
**orb** (ôrb), ***n.*** (١) خڕۆکی زەوی؛ گێتی؛ خڕۆك
(٢) (ا) ئەستێرە؛ ڕۆژ؛ مانگ. (ب) [Obs.]، سەرزەمین؛ سەرزەوی.
(ج) [Obs.]. خولگەی ئەستێرە. (٣) [Poetic]. چاو؛ گۆی چاو.
(٤) خڕۆکی شاهانە. خڕۆکێکە خاچێکی بە سەرەوەیە هێمای دەسەلاتی شاهانەیە. (٥) [Archaic]، (ا) مەودای چالاکی؛ مەیدانی دەسەلات؛ مەیدان.
(ب) پلەوپایە. (٦) گشت؛ هەموو.
(٧) [Rare]. بازنە؛ شتێکی خڕ.
***v.t.*** (١) خڕکردن؛ بازنەکردن. (٢) [Poetic] ، دەورگرتن
***v.i.*** (١) لە خولگەیەکدا سووڕانەوە. (٢) [Poetic] ، خڕبوون.

**orbicular** (ôr-bik′yoo-lēr), ***adj.*** (١) خڕ؛ بازنەیی.
(٢) خڕو تەخت (گەلا). (٣) تەواو؛ سەراپا؛ هەموو.
**orbiculate** (ôr-bik′yoo-lit, ôr-bik′yoo-lāt′), ***adj.*** = orbicular.
**orbiculated** (ôr-bik′yoo-lā′tid), ***adj.*** = **orbiculate.**
**orbit** (ôr′bit), ***n.*** (١) چاڵی چاو.
(٢) خولگە؛ سوڕگە: ***( the earth's ~ round the sun)*** .
(٣) مەودای چالاکی‌و زانین‌و بەسەرهات‌و هەڵسوکەوت: ***( one's social ~ )***
(٤) مەودای دەسەلات‌و دابینکاری؛ ڕکێف.
(٥) پێستی دەوری چاوی باڵندە.
***v.t.*** (١) خستنە خولگەوە (مانگی دەستکرد).
(٢) بەدەوردا خولانەوە؛ سوڕانەوە بەدەوردا:
***( The moon ~s the earth.; He ~s the film world.)***
***v.i.*** سوڕانەوە؛ خولانەوە.
**orc** (ôrk), ***n.*** = **grampus.**
**orchard** (ôr′chērd), ***n.*** (١) باخ. (٢) داری باخ.
**orchardist** (ôr′chērd-ist), ***n. Also*** **orchardman,** باخەوان.
**orchestra** (ôr′kis-trə), ***n.*** (١) سازبەند؛ سازو سەمتوور؛ ئۆرکێسترا؛ دەستەی مۆسیقاژەنان. (٢) جێی سازبەند لە شانۆیەکدا.
(٣) کورسی ڕیزەکانی پێشەوەی شانۆیەك.
-orchestral ***(adj.).***
**orchestrate** (ôr′kis-trāt′), ***v.t. & v.i.*** (١) ساز دانان بۆ سازبەند.
(٢) سازاندن؛ ڕێکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن: ***( to ~ an event)*** .
**orchestration** (ôr′kis-trā′shən), ***n.*** (١) پارچە ئاوازی ئامادەکراو بۆ سازبەند. (٢) سازاندن یا ڕێکخستنی سازی سازبەند.
(٣) سازاندن؛ ڕێکخستن.
**orchid** (ôr′kid), ***n.*** (١) جۆرە گوڵێکە.
(٢) ئەرخەوانی؛ ئەرخەوانیی کاڵ.
**orchitis** (ôr′ki-tis), ***n.*** باگونە.
**ordain** (ôr-dān′), ***v.t.*** (١) ڕێکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن؛ ئامادەکردن.
(٢) لە چارە نووسین؛ وا بۆ دانان؛ فەرماندان؛ بۆ بڕینەوە:
***( God has ~ed death as our lot.)***
(٣) دانان بە قەشە؛ کردن یا دامەزراندن بە قەشە: ***( He was ~ed priest.)***
(٤) دانان بە مالووم.
-ordainment ***(n.).***
**ordeal** (ôr-dēl′, ôr-dē′əl, ôr′dēl), ***n.*** (١) شێوەیەکی دادپرسی کۆنە بۆ بڕیاردانی تاوانبارێتی یا بێ تاوانی گومانبارێك‌و بریتییە لە تاقیکردنەوەیەکی سەختی گومانبارەکە (وەك دەستی خستنە ناو ئاوی لەکوڵەوە)و گوایە ئەگەر بێ تاوان بێ ئەوا خوا دەیپارێزێت‌و زیانی پێ ناگات.
(٢) تاقیکردنەوەیەکی سەخت؛ کارەساتێکی ناخۆش؛ کارێکی سەخت:
***( to go through a terrible ~ )***
**order** (ôr′dēr), ***n.*** (١) پلەوپایەی کۆمەڵایەتی.
(٢) ئاسایش؛ ئاسوودەیی. (٣) ڕیز؛ بەرودوایی.
(٤) نەخشە؛ شێوەی ڕێکخستن؛ پەیڕەو. (٥) تاقم؛ دەستە.
(٦) (ا) ڕێبازێکی ئاینی: ***( a monastic ~ )*** .
(ب) ڕێکخراوی نهێنی.
(٧) (ا) دەستەیەکی خەڵات کراو. (ب) درووشمی ئەم دەستەیە.
(٨) ڕێك‌وپێکی.
(٩) دۆخ؛ بار: ***( The motor was in very poor ~.)*** .
(١٠) فەرمان؛ فەرمایشت؛ فەرموودە. (١١) چەشن؛ جۆر؛ چەشن.
(١٢) ڕێباز؛ ڕێ؛ ڕێگە؛ شێوەی کردنی شتێك.
(١٣) (ا) داوا؛ خواست؛ داواکاری:
***( Have you received my ~ for books?)***
(ب) شتی داواکراو: ***( I delivered her grocery ~.)*** .
(ج) یەك بەش خواردەمەنی داواکراو لە چێشتخانەدا:

***(I'll have an ~ of French fries.)***

(١٤) شێوەی خانووسازی.

(١٥) فەرمانی دادپرس؛ بڕیاری دادپرس.

(١٦) (*pl.*) بڵاونامەی سوپایی.

(١٧) چین (زیندەوەرزانی، ڕووەکناسی).

(١٨) (ا) یەکێك لە نۆ پلە یا جۆرەکانی فریشتە. (ب) پلەیەکی قەشەیەتی.

(ج) (*pl.*) پلەی قەشە: ***(He took holy ~s.)***.

(د) ئاهەنگی کردن بە قەشە.

*v.t.* (١) ڕێکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن؛ ڕیزکردن.

(٢) فەرمان بەسەردا کردن؛ بەسەردا خوڕین؛ فەرمان پێدان.

(٣) داواکردن ***(to ~ groceries, a hamburger, a beer, etc.)***.

(٤) ordain

*v.i.* (١) فەرمانکردن؛ فەرماندان. (٢) داواکردن.

**a large (or tall) order,** کارێکی گران

**call to order,** دەست بە کۆبوونەوە کردن؛ دەستپێکردن (کۆڕ)؛ کۆڕ بەستن: ***(He called the meeting to order.)***.

**in order,** (١) بەڕیز؛ ڕێك‌وپێك. (٢) باش کاردەکات.

(٣) بەپێی پەیڕەوە. (٤) بەجێ؛ شیاو.

**in order that,** بۆئەوەی: تاکو؛ تاوەکو.

**in order to,** بۆئەوەی: تاکو؛ تاوەکو

**in short order,** خێرا؛ یەکسەر؛ زوو.

**made to order,** بەپێی ویستی کڕیار دروستکراوە؛ دەستکرد.

**on order,** داواکراوە بەڵام هێشتا نەگەیشتووە (ئازووقە، کەرەسە).

**on the order of,** وەك.

**order (a person) about,** هەمیشە فەرمان بەسەردا کردن؛ پەیتا پەیتا بەسەردا خوڕان.

**out of order,** (١) نارێك‌وپێك؛ لە ڕیز چووە دەرەوە.

(٢) شکاو؛ پەککەوتوو؛ لەکارکەوتوو؛ تێکچوو

(٣) ناپەیڕەوی؛ بەگوێرەی پەیڕەو نییە (خواست، پێشنیاز، یا بەرپەرچدانەوەی کەسێك لە کۆڕێکدا).

(٤) نابەجێ؛ نەشیاو؛ لە جێی خۆیدا نییە.

**take holy orders,** بوون بە قەشە؛ کران بە قەشە.

**orderliness** (ôr′dēr-li-nis), *n.* ڕێك‌وپێکی.

**orderly** (ôr′dēr-li), *adj.* (١) ڕێك‌وپێك؛ جوان ڕێکخراو؛ پاك‌وتەمیز:
***(an ~ room)***

(٢) بە ئاشتی؛ ئاسایشانە:
***(an ~ crowd; an ~ transition of power)***

(٣) هی ڕاگەیاندنی فەرمانی سوپایی.

*n.* (١) سەربازی بەردەستی ئەفسەر.

(٢) بەردەستی خەستەخانە.

**ordinal** (ôr′d'n-əl, ôr′di-n'l), *adj.* (١) پلەیی (ژمارە):
**(first, second, third, tenth, thirtieth, etc. 1st, 2nd, 10th, 30th, etc.)**

(٢) هی جینە زیندەوەر یا ڕووەك

*n.* (١) ordinal number. (٢) [O-]. کتێبی نوێژکردن.

**ordinal number,** ژمارەی پلەیی.
**(first, second, third, ninth, fourteenth, etc.)**

(وشەی " cardinal number " ببینە).

**ordinance** (ôr′di-nəns), *n.* (١) فەرمان. (٢) نەریت.

(٣) نەریتی ئاینی (بەتایبەتی هی شێوی پیرۆز لە کڵێسەدا).

(٤) یاسای شارەوانی؛ یاسای ناوخۆی شار: ***(a city ~)***.

**ordinarily** (ôr′d'n-er′ə-li, ôr′də-nâr′ə-li), *adv.* بە ئاسایی؛ بە زۆری

**ordinary** (ôr′d'n-er′i), *adj.* (١) ئاسایی.

(٢) ڕەمەکی؛ هەڕەمە؛ بازاڕی؛ ساکار.

*n.* (١) کەسێك، شتێك، یا بارێکی ئاسایی.

(٢) کاربەدەستێکی کڵێسە یا دادگای ئاسایی (واتە جێگری کەسێکی تر نەبێت).

(٣) (ا) ئەو بەشەی نوێژی ناو کڵێسە کە هیچ ناگۆڕێت.

(ب) ئامێلکەی ئەم نوێژە. (ج) قەشەی بەندیخانە.

(٤) (ا) ژەمێك خواردنە کە چێشتخانەیەك هەموو ڕۆژێك لە هەمان کاتدا پێشکەشی دەکات بە هەمان نرخ. (ب) چێشتخانەیەکی وەها.

(٥) درووشمی سوارچاکی ئاسایی.

-ordinariness *(n.)*.

**out of the ordinary,** نائاسایی؛ نائاسا؛ سەرنائاسا

**ordination** (ôr′də-nā′shən), *n.* (١) (ا) کردن بە قەشە؛ بوون بە قەشە. (ب) ئاهەنگی کردن بە قەشە. (٢) ڕێکخستن؛ هاوپۆل کردن.

**ordnance** (ôrd′nəns), *n.* (١) تۆپ (سوپا).

(٢) کەرەسەی جەنگ؛ تەقەمەنی؛ چەکی جەنگ.

**ordonnance** (ôr′də-nəns), *n.* (١) ڕێکخستن (وێژە، نیگارکێشی، خانووسازی)؛ سازدان. (٢) یاسا؛ یاسای شارەوانی؛ فەرمان؛ فەرماننامە

**ordure** (ôr′jēr, ôr′dyoor), *n.* (١) پیسایی؛ شیاکە؛ گوو.

(٢) شتێکی ڕەووشت پیسکەر.

**ore** (ôr, ōr), *n.* کانزای خاو؛ کانزای پاك نەکراوە.

**oread** (ôr′i-ad′, ōr′i-ad′), *n.* بووك یا حۆری گردو شاخ (ئەفسانەی یۆنانی).

**oregano** (ō-re′gə-nō′), *n.* جاترە.

**organ** (ôr′gən), *n.* (١) ئۆرگەن: ئامێرێکی مۆسیقایی بۆریدارە لە پیانۆ دەچێ. (٢) ئەندام (لەش).

(٣) دەزگا؛ هۆ؛ ئامێر؛ پێکار:
***(Parliament is the chief ~ of government.)***

(٤) هۆی ڕاگەیاندنی حیزبێك یا ڕێکخراوێك (ڕۆژنامە، گۆڤار)؛ ئۆرگان.

**organic** (ôr-gan′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە ئەندام؛ ئەندامی.

(٢) ناوەکی؛ خۆیی؛ بەشێکی لێ جیانەبووەوەیە: ***(an ~ part)***.

(٣) ڕێکخراو؛ یەك ئاواز؛ ڕێك‌وپێك؛ سازاو: ***(an ~ whole)***

(٤) ئۆرگانیك (کیمیا). (٥) زیندە؛ زیندە ماددە.

(٦) (ا) بە پەین پەروەردەکراو نەك بە پەینی کیمیایی؛ بەشێوەی سرووشتی بەخێوکراو: ***(~ gardening; ~ vegetables, foods, etc.)***.

(ب) هۆرمۆنات یا ماددەی کیمیایی تێ نەکراوە: ***(~ meat)***.

(ج) خاکی؛ سرووشتی؛ سادە: ***(an ~ lifestyle)***.

(٧) بنچینەیی؛ بناغەیی.

-organically *(adv.)*.

**organic chemistry,** کیمیای ئۆرگانیك.

**organicism** (ôr-gan′ə-siz'm), *n.* (١) تیۆرییەکە دەڵێت: کە هەموو نەخۆشییەك لە گۆڕانی ئەندامی لەشەوە تووش دەبێت.

(٢) بیروباوەڕێکە کە دەڵێت: کۆمەڵ وەك زیندەوەرێك وایە.

**organism** (ôr′gən-iz'm), *n.* (١) زیندەوەر؛ گیانەوەر

(٢) ڕێکخراوێك یا شتێکی لە زیندەوەر چوو؛ ڕژێم؛ دەزگا: ***(the social ~)***.

**organist** (ôr′gən-ist), *n.* ئۆرگەنژەن؛ ئۆرگەن لێدەر.

**organization** (ôr′gən-ī-zā′shən), *n.* (١) ڕێکخستن؛ سازدان

(٢) (ا) شێوەو پلەی ڕێکخستن یا ڕێکخراوی: ***(a high degree of ~)***

(ب) پێکهاتن. (٣) (ا) دەزگا؛ شتێکی یەك پێ گیراو یا یەکخراو؛ کۆمەڵ

(ب) ڕژێم. (٤) ڕێکخراو؛ یەکێتی.

(٥) دەستەی فەرمانگێڕیی ڕێکخراوێك.

**organize** (ôr′gən-īz′), *v.t.* (١) ڕێکخستن؛ ڕێك‌وپێك کردن؛ سازدان:
***(to ~ one's thoughts before speaking)***

(٢) ڕێکخستن: ***(to ~ a strike)***.

(٣) دانان؛ دامەزراندن؛ ڕێکخراو دانان: ***(to ~ a club)***.

(٤) یەکێتی کرێکاران دانان؛ یەك پێگرتنی کرێکاران:
***(to ~ a union; to ~ the workers in a union)***

*v.i.* (١) پێکهاتن؛ بوون بەیەك؛ یەکگرتن.

(٢) چوونە ناو یەکێتی کرێکارانەوە؛ بوون بە ئەندام لە ڕێکخراوێکدا.

**organizer** (ôr′gən-īz′ẽr), *n.* ڕێکخەر، یەکێتی کرێکاران، ڕێکخراو، حیزب... هتد)

**organo-** (ôr′gə-nō), پێشگرێکە بەمانای: ئەندامی؛ زیندەڵەیی.

**organogenesis** (ôr′gə-nō-jen′ə-sis), *n.* سەرچاوەو پێکهاتنی ئەندام

**organography** (ôr′gə-nog′rə-fi), *n.* باسکردنی زانستییانەی ئەندامی گیانلەبەرو ڕووەك

**organology** (ôr′gə-nol′ə-ji), *n.* ئەندامناسی: زانستی شێوەو پێکهاتن و پەرەسەندن و کاری ئەندامی گیانەوەر

**organon** (ôr′gə-non′), *n.* (١) هۆی بیرکردنەوەو فێربوون؛ هۆی راگەیاندنی زانیاری. (٢) ڕێبازی لێکۆڵینەوە؛ هۆی لێکۆڵینەوە.

**organum** (ôr′gə-nəm), *n.* (١) organon.
(٢) پارچەیەك مۆسیقای هەمەدەنگ.

**organza** (ôr-gan′zə), *n.* جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە.

**orgasm** (ôr′gaz′m), *n.* ئاوهاتنەوە؛ ڕەحەت بوون.

**-orgasmic** *(adj.)*.

**orgiastic** (ôr′ji-as′tik), *adj.* تایبەتی بە " orgy " (ووشەی دوایی ببینە).

**orgy** (ôr′ji), *n.* (١) ئاهەنگی گۆرانی و سەماو خواردنەوەو جووت بوون لە یۆنان و ڕۆمای کۆندا بەبۆنەی پەرستنی هەندێك لە خوداکانەوە.
(٢) گەلەگان؛ ئاهەنگی گانی بە کۆمەڵ.
(٣) بەر بۆ حۆ بەرەڵاکردن لە شتێکدا؛ لە ئەندازە بەدەر خەریك بوون بە کارێکەوە *( an ~ of work, reading, etc.)*

**oriel** (ôr′i-əl, ō′ri-əl), *n.* پەنجەرەیەکی گەورەی دەرپۆقیو

**orient** (ôr′i-ənt, ō′ri-ənt), *n.* (١) [Poetic]: ڕۆژهەلات.
(٢) [O-]: (١) ڕۆژهەلات؛ ئاسیا. (ب) ڕۆژهەلاتی دوور (چین، یابان... هتد).
(٣) (ا) بریقەی مرواری؛ ئەو تایبەخۆییەی باشی مرواری دەنوێنێ. (ب) مرواری باش

*adj.* (١) [Poetic]: ڕۆژهەلاتی.
(٢) بریقەدار؛ درەوشاوە؛ نایاب؛ زۆر بەنرخ
(٣) [Poetic]: بەرزبووەوە (وەك خۆر).

*v.t.* (١) ڕووکردنە ڕۆژهەلات (خانوو)؛ بەرەو ڕۆژهەلات وەرگێران.
(٢) ڕاهێنان؛ ڕاهاتن بە باروو هەلوێستەوەرووبەری تازە؛ شارەزاکردن؛ پێناسین.

*v.i.* (١) ڕووکردنە ڕۆژهەلات. (٢) ڕاهاتن بە بارو دەورووبەرو هەلوێستی تازە.

**oriental** (ôr′i-en′t′l, ō′ri-en′t′l), *adj.* (١) ڕۆژهەلاتی
(٢) [O-]: هی ڕۆژهەلاتی دوورو گەل و کلتوورەکانی.

*n.* [O-], کەسێکی ڕۆژهەلاتی دوور (وەك چینی و یابانی)؛ هاوولاتییەکی ڕۆژهەلاتی دوور.

*? Does he have a humanistic ~ ? )*

(٤) توانای گەڕانەوەی هەندێ باڵندەو گیاندار بۆ هێلانەو لانەکانیان لە شوێنی دوورەوە بەبێ سەر لێ تێکچوونیان

**Orientalism** (ôr′i-en′t′l-iz′m, ō-ri-en′t′l-iz′m), *n.*
(١) خوونەریتی گەلانی ڕۆژهەلات؛ خوو نەریتی ڕۆژهەلاتی.
(٢) زانین و لێکۆڵینەوەی زمان و کلتووری گەلانی ڕۆژهەلات؛ ڕۆژهەلاتناسی.

**Orientalist** (ôr′i-en′t′l-ist, ō-ri-en′t′l-ist), *n.* ڕۆژهەلاتناس

**Orientalize** (ôr′i-en′t′l-īz′, ō-ri-en′t′l-īz′), *v.t.* وەکو ڕۆژهەلاتی لێکردن (لە ڕووخسارو ڕووالەت و تایبەخۆدا).

*v.i.* وەك ڕۆژهەلاتی لێهاتن.

**Oriental rug,** قالیی ڕۆژهەلاتی؛ مافوور یا فەرشی ڕۆژهەلاتی. (پێشتی دەوترێ " Oriental carpet " ).

**orientate** (ôr′i-en-tāt′, ō کون؛ دەم؛ دەرچە

**oriflamme** (ôr′ə-flam′, or′ə-flam′), *n.* (١) ئالای جەنگی فەرەنسای کۆن؛ ئالای جەنگ. (٢) ئالای پیرۆزی هاندەر؛ درووشمی بەرز.

**origin** (ôr′ə-jin, or′ə-jin), *n.* (١) سەرەتا؛ پەیدابوون.
(٢) بنەچە؛ ڕەچەڵەك؛ بنەماڵە.
(٣) سەرچاوە؛ بنج وبناوان؛ ماك؛ بناوان.

**original** (ə-rij′ə-n′l), *adj.* (١) یەکەم؛ پێشترین؛ هی سەرەتا: *( the ~ inhabitants of a country)*
(٢) تازە؛ ڕەسەن؛ بێ وێنە؛ نوێ؛ لەوەو پێش نەکراوە یا نەبووە: *( ~ ideas)*
(٣) داهێنەر؛ شتی تازە داهێنەر: *( an ~ writer)*.
(٤) تایبەتی بە وێنەی سەرەتایی (کە وێنەی تری لەبەر وەردەگیرێ).

*n.* (١) وێنەی سەرەتایی (کە وێنەی تری لەبەر وەردەگیرێ): *( This is not the ~ but only a copy.)*
(٢) بەرهەمی هونەری یا وێژەی ڕەسەن.
(٣) کەسێك کە نوێنرابێ لە تابلۆیەکدا یا سەرباسی چیرۆکێك بێت
(٤) کەسێکی داهێنەر؛ داهێنەر. (٥) کەسێکی سەیر.
(٦) ئەو زمانەی کە لە سەرەتاوە بەرهەمێکی وێژەیی پێ نووسراوە *( to read Homer in the ~ )*

**originality** (ə-rij′ə-nal′ə-ti), *n.* (١) ڕەسەنی؛ تازەیی (بەرهەمی هونەری و وێژەیی... هتد): *( His work does not show much ~ .)*.
(٢) شتێکی ڕەسەن یا تازە

**originally** (ə-rij′ə-n′l-i), *adv.* (١) لە سەرەتاوە؛ لە بنچینەوە.
(٢) بە شێوەیەکی دیارو جیاواز؛ بە ڕەسەنی.

**original sin,** یەکەم گوناهی ئادەم (ئاین).

**originate** (ə-rij′ə-nāt′), *v.t.* داهێنان؛ هێنانەڕوو؛ دەستپێکردن.

*v.i.* داهاتن؛ پەیدابوون؛ هاتنەڕوو؛ دەستپێکردن.

**-origination** *(n.)*.

**originative** (ə-rij′ə-nā′tiv), *adj.* داهێنەر؛ توانای داهێنانی هەیە.

**originator** (ə-rij′ə-nā′tẽr), *n.* داهێنەر؛ دەستپێکەر.

**oriole** (ôr′i-ō′ri-en′tāt), *v.t. & v.i.* (١) ڕووکردنە ڕۆژهەلات؛ ڕووکردنە لایەك. (٢) ڕاهاتن؛ شارەزابوون؛ چاووگوێ کردنەوە یا کرانەوە؛ شارەزاکردن: *( to ~ oneself)*.

**orientation** (ôr′i-en-tā′shən), *n.* (١) (ا) ڕاهاتن؛ ڕاهێنان. (ب) شارەزابوون؛ شارەزاکردن؛ پیشاندان؛ پێناسین؛ چاوو گوێ کرانەوە: *( an ~ week for new students at the university)*
(٢) (ا) ڕووکردنە ڕۆژهەلات؛ دروستکردنی کڵێسە بە جۆرێك کە قوربانیگاکەی یا پێش نوێژگاکەی لە لای ڕۆژهەلاتەوە بێت. (ب) ڕوو؛ لا.
(٣) شێوەی بیرکردنەوەو فەلسەفەو مەیل و هەڵوێست: *( What is the ~ of the new president*

**orifice** (ôr′ə-fis, or′ə-fis), *n.* l′, ō′ri-ōl′), *n.* باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگە لە توخمی ڕیشۆڵە.

**orison** (ôr′i-z′n, or′i-z′n), *n.* ( usually in plural ), نوێژ؛ نزا.

**ormolu** (ôr′mə-lōō′), *n.* زەرد؛ زێڕە درۆزنە (لە مسی زەردو کانزای تر پێکدێت و شتی پێ دەڕازێنرێتەوە).

**ornament** (ôr′nə-mənt), *n.* (١) جوانکەر؛ شتی ڕازێنەرەوە؛ نەخش ونیگار. (٢) خشڵ؛ تیتە. (٣) ئارایشت؛ ئارایش.
(٤) جێی شانازی؛ کەسێك کە جێی شانازی بێت بۆ کۆمەڵ یا پیشەکەی.

*v.t.* ڕازاندنەوە؛ جوانکردن.

**ornamental** (ôr′nə-men′t′l), *adj.* ڕازێنەرەوە؛ جوانکەر؛ هی ڕازاندنەوە.

*n.* شتێکی جوان و ڕازێنەرەوە (بەتایبەتی درەختێك یا ڕووەکێك کە بۆجوانییەکەی دەڕوێنرێت نەك بۆ بەرەکەی).

**ornamentation** (ôr′nə-men-tā′shən), *n.* (١) ڕازاندنەوە؛ جوانکردن؛ جوانکاری. (٢) شتی جوان و ڕازێنەرەوە؛ خشڵ.

**ornate** (ôr-nāt′), *adj.* (١) زۆر ڕازاوە؛ لە ڕادە بەدەر ڕازاوە: *( an ~ hall)*
(٢) ڕازاوە (وێژە): *( an ~ literary style)*.

**-ornately** *(adv.)*; **ornateness** *(n.)*.

**ornery** (ôr′nẽr-i), *adj.* (١) بێ حەیا و چەقاوەسوو؛ شەڕەنگێز؛ تەنگەجیکڵانە؛ بەدڕەفتار. (٢) کەللەڕەق؛ سەرسەخت. (٣) پیس و بۆگەن؛ بێ نرخ. (٤) هەرەمە؛ ڕەمەکی؛ بازاڕی.

**ornithic** (ôr-nith′ik), *adj.* باڵندەیی؛ هی باڵندە.

**ornitho-, ornith-** (ôr′ni-thō, ôr′ni-thə), پێشگرێکە بەمانای: باڵندە

**ornithologist** (ôr′ni-thol′ə-jist), *n.* باڵندەناس؛ زانای باڵندە.

**ornithology** (ôr′ni-thol′ə-ji), *n.* باڵندەناسی؛ زانستی باڵندە.

**-ornithological** *(adj.).*

**oro-** (ôr′ō, or′ə), پێشگرێکە بەمانای: شاخ؛ کێو؛ چیا.

**orogenesis** (ôr′ə-jen′ə-sis), *n.* = orogeny.

**orogeny** (ô-roj′ə-ni), *n.* شاخ و کێو پێکهاتن (بەتایبەتی لە ئەنجامی جووڵانەوەی زەمینەوە)؛ پەیدابوونی چیا.

**orography** (ô-rog′rə-fi), *n.* شاخ وکێوناسی (کە بەشێکە لە جوگرافیا)

**-orographic; orographical** *(adj.).*

**oroide** (ō′rō-īd′, ō′rō-id), *n.* دارشتەی زەرد یا زێڕە درۆزنە: دارشتەیەکە لە مس و توتیا و تەنەکە پێکدێت لە زێڕ دەچێ خشڵی هەرزانبەهای لێ دروست دەکرێت.

**orometer** (ô-rom′ə-tẽr), *n.* پێوەری بەرزی شاخ.

**orotund** (ôr′ə-tund′, ō′rə-tund′), *adj.* (١) گەورە (دەنگ)؛ دەنگدەرەوە؛ پڕ و زرنگاوە. (٢) بە تەنتەنە (گفتوگۆ، نووسین)؛ بە کەش وفش؛ ڕازاوە؛ خۆهەڵکێشاو: *( ~ talk)* .

**orphan** (ôr′fən), *n.* هەتیو؛ بێ باوک و دایک؛ بێ باوک یا دایک.

*adj.* (١) هەتیو. (٢) هی هەتیو: *( an ~ home)* .

*v.t.* هەتیوکردن؛ کردن بە هەتیو.

**orphanage** (ôr′fən-ij), *n.* (١) هەتیوی؛ هەتیوێتی. (٢) هەتیوخانە. (٣) هەتیوان.

**orphanhood** (ôr′fən-hood′), *n.* هەتیوی؛ هەتیوێتی.

**Orpheus** (ôr′fi-əs, ôr′fūs), *n.* ئۆرفیەس: سازژەنێك بوو سازی ئەوەندە دڵگیری لێدەدا گیاندارو دارو بەردی دەجووڵاند (ئەفسانەی یۆنانی).

**Orphic** (ôr′fik), *adj.* (١) تایبەتی بە بیروباوەڕو نەریتی " ئۆرفیەس " . (وشەی پێشوو ببینە). (٢) خۆش و دڵگیر وەك ئاوازی " ئۆرفیەس " ؛ دڵفڕین ئاوان (٣) [o-]، نادیار؛ لێڵ؛ شاراوە.

**orphrey** (ôr′fri), *n.* تیرەیەکی نەخش و نیگاراوییە بە عەبای قەشەوە.

**ortho-** (ôr′thō, ôr′thə), پێشگرێکە بەمانای: (١) ڕێك؛ ڕاست؛ ستوونی. (٢) گۆشەی ڕاست. (٣) ڕاست؛ تەواو؛ بە جوانی و باشی کراو: *( orthography)* . (٤) ڕاستکردنەوەی چەوتی و ناتەواوی (بەتایبەتی ئێسقان): *( orthopedics)*

**orthodontia** (ôr′thə-don′shi-ə), *n.* ڕاستکردنەوەی ددان و شەویلگی خواروخێچ (پزیشکەوانی).

**orthodontic** (ôr′thə-don′tik), *adj.* تایبەتی بە ڕاستکردنەوەی ددان و شەویلگی خواروخێچ.

**orthodontics** (ôr′thə-don′tiks), *n.* = orthodontia.

**orthodontist** (ôr′thə-don′tist), *n.* ددان ڕاستکەرەوە؛ دانسازی ڕاستکردنەوەی ددان و شەویلگی خواروخێچ.

**orthodox** (ôr′thə-doks′), *adj.* (١) لەسەر ئایینی باو؛ بەپێی ئایینی چەسپیوو کۆن باو. (٢) بەپێی نەریت و دەستووری کۆن و چەسپیو: *( ~ ideas)* (٣) [O-]، تایبەتی بە کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی: *( O~ church)* .

**orthodoxy** (ôr′thə-dok′si), *n.* (١) ڕاستێتی (بیروباوەڕ، ڕەووشت، کردەوە)؛ پەیڕەوی کردنی نەریت و دەستووری کۆن و چەسپیو. (٢) بیروباوەڕو کردەوەو نەریت و دەستووری کۆن.

**orthoepy** (ôr-thō′i-pi, ôr′thō-i-pi), *n.* (١) زانستی دەنگ؛ دەنگناسی (زمانەوانی). (٢) بێژانی ڕێك وپێك؛ بێژەی ڕاست یا تەواو.

**-orthoepic** *(adj.)*; **orthoepist** *(n.).*

**orthogenesis** (ôr′thə-jen′ə-sis), *n.* (١) بیروباوەڕێکە کە دەڵێت: گۆڕان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بە ڕێك وپێکی و بەپێی پەیڕەوێکی تایبەتی ڕوودەدات نەك هەر لەخۆوە (زیندەوەرزانی). (٢) بیروباوەڕێکە دەڵێت: کە هەموو گەلێك یا کۆمەڵێك بە هەمان قۆناغی گۆڕیندا تێ دەپەڕێ، ئەگەرچی دەوروبەریشی جیاواز بێت (کۆمەڵناسی).

**-orthogenetic** *(adj.)*; **orthogenetically** *(adv.).*

**orthogonal** (ôr-thog′ə-n′l), *adj.* هی گۆشەی وەستاو؛ تایبەتی بە گۆشەی ڕاست.

**orthography** (ôr-thog′rə-fi), *n.* (١) ڕێنووس؛ نووسینەوەی ڕاست. (٢) حونجەکردن؛ حونجە. (٣) خۆش نووسی؛ دەسخەت خۆشی.

**-orthographic; orthographical** *(adj.).*

**orthopedic, orthopaedic** (ôr′thə-pē′dik), *adj.* تایبەتی بە پزیشکەوانی ئێسقان؛ هی ئێسقانی شکاو گرتنەوە یا نەشتەرکاری کردن.

**orthopedics** (ôr′thə-pē′diks), *n.pl.* پزیشکەوانی ئێسقان؛ نەشتەرکاری ئێسقان.

**orthopedist, orthopaedist** (ôr′thə-pē′dist), *n.* پزیشکی ئێسقان.

**orthopedy** (ôr′thə-pē′di), *n.* = orthopedics.

**orthoscope** (ôr′thə-skōp′), *n.* ئامێری تێڕوانینی چاو (پزیشکەوانی)؛ بینەری چاو.

**ortolan** (ôr′tə-lən), *n.* باڵندەیەکی گۆشت خۆشە لە توخمی چۆلەکەیە.

**-ory** (ôr′i), پاشگرێکە بەمانای: (١) هی؛ وەك؛ تایبەتی بە. (٢) جێ؛ مەڵبەند؛ – خانە: *( directory)* .

**oryx** (ôr′iks, ō′riks, or′iks), *n.* مانگا کێوی ئەفەریقا؛ کەڵەکێوی.

**oscillate** (os′ə-lāt′), *v.i.* (١) لەرینەوە؛ لەرانەوە. (٢) ڕاڕایی کردن؛ دوودڵی کردن؛ گۆڕان.

**oscillation** (os′ə-lā′shən), *n.* (١) لەرینەوە؛ لەرانەوە (٢) ڕاڕایی؛ دوودڵی؛ دوودڵی کردن؛ گۆڕان. (٣) لەرەلەر (ئەلەکتریك).

**oscillator** (os′ə-lā′tẽr), *n.* (١) (ا) لەرەلەرکەر؛ لەرۆك. (ب) ڕاڕاکەر؛ دوودڵی کەر. (٢) ئامێری لەرەلەر دروستکەر (ڕادیۆ، ئەلەکتریك).

**oscillogram** (ə-sil′ə-gram′, os′i-lə-grăm′), *n.* وێنەی لەرینەوە (ئەلەکتریك).

**oscillograph** (ə-sil′ə-graf′, os′i-lə-grăf′), *n.* تۆمارکەری لەرینەوەی تەووژمی ئەلەکتریکی.

**oscilloscope** (ə-sil′ə-skōp′), *n.* = oscillograph.

**oscitancy** (os′i-tən-si), *n.* (١) باوێشك دان. (٢) خەواڵوویەتی.

**osculant** (os′kyoo-lənt), *adj.* (١) (ا) ماچکەر؛ ماچکەری. (ب) بەرکەوتوو؛ لێخشاو. (٢) ناوکۆ (تایبەخۆی دوو توخمی زیندەوەر).

**osculate** (os′kyoo-lāt′), *v.t. & v.i.* (١) ماچ کردن. (٢) بەرکەوتن؛ لێخشان؛ لێوەدان. (٣) بەشداربوون لە چەند تایبەخۆیەکدا (زیندەوەرزانی). (٤) لێکەوتن (ئەندازە).

**osculation** (os′kyoo-lā′shən), *n.* (١) ماچ کردن؛ ماچ کران. (٢) ماچ. (٣) بەرکەوتن؛ لێخشان؛ لێدان. (٤) خاڵی لێکدان (ئەندازە)؛ لێکدان.

**-ose** (ōs), پاشگرێکە بەمانای: کاربۆهیدرات (وەك نیشاستەو شەکر): *( sucrose)*

**-ose** (ōs), پاشگرێکە بەمانای: پڕە لە؛ ئەو تایبەخۆدییەی هەیە؛ – ئاسا: *( bellicose, morose)*

**osier** (ō′zhẽr), *n.* (١) دارەبی (بەتایبەتی ئەو جۆرە دارەبییەی کە خەڵفەکانی سەبەتەو زەمیلەی لێ دروست دەکرێ). (٢) خەڵفی دارەبییەکی وەها.

**-osis** (ō′sis), پاشگرێکە بەمانای: (ا) بار؛ دۆخ؛ کار: *( osmosis)* . (ب) نەخۆشی: *( neurosis)* .

(٤) [Obs.] هەبوون؛ بوون.

*v.i.* قەرزاربوون؛ قەرز لەسەر بوون

**owing** (ō′iŋ), *adj.* هێشتا نەدراوەتەوە (قەرز)

***( There are ten dollars ~ .)***

**owing to,** بەهۆی؛ لەبەر

***( Owing to the floods, we couldn't come.)***

**owl** (oul), *n.* (١) کوندەپەپوو؛ بایەقووش؛ پەپوو

(٢) کەسێکی شەوەکی؛ کەسێك کە شەو تا درەنگ نەنوێ.

(٣) کەسێکی رووخسار بە شکۆ یا سەنگین

**owlet** (oul′it), *n.* (١) بەچکە کوندەپەپوو؛ کوندەپەپووی بچووك.

(٢) جۆرە کوندەپەپوویەکی بچووکە

**owlish** (oul′ish), *adj.* بایەقووشی؛ لە کوندەپەپوو دەچێت.

**own** (ōn), *adj.* هی خۆ

***( This is my ~ house.; I saw it with my ~ eyes.)***

*n.* ***( That is his ~ .; I am on my ~ .)*** هەر هی خۆ؛ خۆ

*v.t.* ***( Who ~s this house?)*** (١) هەبوون؛ بوون؛ خاوەن بوون

(٢) پێ نیشان؛ دان پیادانان. ***( to ~ one's faults)***

***v.i.* ( ~ to ),** پێ لێنان؛ دان پیادانان؛

***( to ~ to having stolen something)***

**be one's own man,** لەژێر دەستی کەسدا نەبوون؛ سەربەخۆ بوون؛ پیاوی کەس نیبەو بە هەوەسی خۆی رەفتار دەکات

**come into one's own,** پێگەیشتن؛ گەیشتنە ئاواتی خۆ

**hold one's own,** خۆراگرتن (لەبەردەم هێرش یا رەخنەدا)؛ جێی خۆ بەرنەدان؛ دەرەقەت هاتن؛ بەرگەگرتن

**of one's own,** ***( He has nothing of his own.)*** هی خۆ

**on one's own,** [Colloq.]. سەربەخۆ؛ هەر خۆ؛ خۆ بە خۆ؛ بە تەنها؛ تەنها خۆ

***( He's living on his own now.; Can you do the work on your own?)***

**own up (to),** دان پیا نان؛ پێ لێنان (تاوان).

**owner** (ōn′ẽr), *n.* خاوەن

**ownership** (ōn′ẽr-ship′), *n.* خاوەنداری؛ خاوەندارێتی؛ هەبوون؛ خاوەنێتی

**ox** (oks), *n.* (pl. oxen ), (١) گای خەساو؛ گا

(٢) گیاندارێك لە توخمی گاو مانگا.

**ox-,** = oxy-

**oxbow** (oks′bō′), *n.* (١) کەلەمە (٢) شتێکی کەلەمەیی یا کەوانەیی وەك پێچی رووبارێك. (٣) زەوی نێوان پێچێکی وەها.

**oxen** (ok′s'n), *n. plural of* ox.

**oxeye** (oks′ī′), *n.* چاوەگا: جۆرە رووەکێکە

**oxford** (oks′fẽrd), *n.* (١) جۆرە پێڵاوێکی قەبەی پاژنە نزمە

(٢) جۆرە قوماشێکی لۆکەیە

**oxheart** (oks′härt′), *n.* (١) جۆرە گێلاسێکی گۆشتنە لە شێوەی دڵدایە (٢) جۆرێکە لە کەلەرم

**oxidation** (ok′sə-dā′shən), *n.* ژەنگ هەڵهێنان؛ ژەنگ گرتن

**oxide** (ok′sīd, ok′sid), *n.* ئۆکسید (کیمیا)

**oxidize** (ok′sə-dīz′), *v.t.* (١) ئۆکسجین تێکردن؛ یەك پێگرتن لەگەڵ ئۆکسجیندا؛ ئۆکسیدکردن (٢) ژەنگ پێ گرتن؛ ژەنگ پێ هەڵهێنان.

*v.i.* (١) یەکگرتن لەگەڵ ئۆکسجیندا؛ ئۆکسجین تێکەڵاوبوون.

(٢) ژەنگ گرتن؛ ژەنگ هەڵهێنان.

**oxidizer** (ok′sə-dīz′ẽr), *n.* ماددەی ژەنگگر: ماددەی ژەنگ پێگر

**Oxonian** (ok-sō′ni-ən), *adj.* ئۆکسفۆردی (١) هی شاری ئۆکسفۆرد لە ئینگلتەرە (٢) هی زانکۆی ئۆکسفۆرد.

*n.* (١) قوتابی زانکۆی ئۆکسفۆرد؛ دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد

(٢) دانیشتوویەکی شاری ئۆکسفۆرد

**oxtail** (oks′tāl′), *n.* کلکە گا (بەتایبەتی کە شۆربای پێ لێ دەنرێت)

**oxtongue** (oks′tuŋ′), *n.* زمانە گا: چەند جۆرە رووەکێکە گەڵاکەیان زبرەو لە زمانی گا دەچێت

**oxy-** (ok′si), *Also* ox-, پێشگرێکە بەمانای: ئۆکسجیناوی؛ ئۆکسجینی تێدایە.

**oxy-** (ok′si, ok′sə), پێشگرێکە بەمانای: تیژ؛ نووك تیژ؛ توندوتیژ

**oxygen** (ok′si-jən), *n.* ئۆکسجین.

**oxygenate** (ok′si-jə-nāt′), *v.t.* ئۆکسجین تێکەڵاوکردن؛ ئۆکسجین تێکردن.

-oxygenation *(n.).*

**oxygen mask,** کڵاوە ئۆکسجین: دەخرێتە سەر دەمو لووت بۆ ئۆکسجین وەرگرتن و هەناسەدان.

**oxygen tent,** چادرە ئۆکسجین: سەرو شانی نەخۆشی دەخرێتە ژێر بۆ هەناسەدان بە ئاسانی.

**oxymoron** (ok′si-môr′on, ok′si-mō′ron), *n.* ووتەیەکە بریتییە لە یەکگرتنی دوو ووشەی دژ بە یەك:

( sweet sorrow; cold fire; a mournful optimist)

**oxytone** (ok′si-tōn′), *adj.* دوا برگەی هێزی لەسەرە؛ دوا برگەی بە زمان دەگیرێ

*n.* ووشەیەکە کە دوا برگەکەی هێزی دەخرێتە سەر یا بە زمان دەگیرێ

**oyster** (ois′tẽr), *n.* (١) گوێچکەماسی.

(٢) شتێکی بەکەڵك؛ شتێکی سوود لێ وەرگیراو.

(٣) [Slang]، کەسێکی بێ دەنگ؛ کەسێکی نەدوو.

**oyster bed,** جێنشینی گوێچکەماسی (لە بنی دەریادا).

**oyster catcher,** گوێچکەماسی گرە: چەند جۆرە باڵندەیەکی قەراغ ئاوی دەنووك پووازی لاق ئەستوورن.

**oysterman** (ois′tẽr-mən), *n.* (١) گوێچکەماسی فرۆش؛ راوکەری گوێچکەماسی؛ گوێچکەماسی بەخێوکەر (٢) بەلەمی راوە گوێچکەماسی.

**oz.,** = ounce.

**ozone** (ō′zōn, ō-zōn′), *n.* (١) ئۆزۆن: شێوەیەکە لە ئۆکسجین.

(٢) [Slang]، هەوای پاك

**ozonic** (ō-zon′ik, ō-zō′nik), *adj.* ئۆزۆناوی؛ ئۆزۆنی تێدایە؛ تایبەتی بە ئۆزۆن

**ozonide** (ō′zō-nīd′), *n.* ئاوێتەی ئۆزۆن

**ozonize** (ō′zə-nīz′), *v.t.* (١) ئۆزۆن گۆڕین بۆ ئۆکسجین.

(٢) ئۆزۆن تێکردن

**ozonous** (ō′zə-nəs), *adj.* ozonic.

**ozs.,** = ounces.

# P p

**P, p** (pē), *n.* (١) تیپی شانزەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " پ " (٣) قاڵبی ئەم تیپە
(٤) نیشانەی شانزەهەمین لە ریزێکدا
*adj.* (١) تایبەتی بەم تیپە (٢) شانزەهەم؛ شانزەهەمین
**mind one's p's and q's,** ئاگا لە دەمو کرداری خۆ بوون؛
وریای زمانو کرداری خۆ بوون.
**P** (pē), *n.* (١) شتێکە لە شێوەی P دا
(٢) ژمارە ٤٠٠ ی رۆمانییە
**pa** (pä), *n.* [Colloq.]. باوک؛ بابە؛ باوە
**paca** (pä'kə, pak'ə), *n.* گیاندارێکی ئەمەریکی قرتێنەری شەوەکی
بەڵەکاوییە.
**pace** (pās), *n.* (١) هەنگاو (٢) درێژی هەنگاوێک؛ ماوەی هەنگاوێک
(٣) خێرایی لە پێ رۆیشتن، راکردن... هتد: *( a fast ~ ; a slow ~ )*
(٤) (ا) خێرایی پێشکەوتن، پەرەسەندن)
(ب) هاوخێرایی؛ خێرایی هاوتا. *( Try to keep ~ with me.)*
(٥) رەوت؛ پیاسە (٦) جۆرە رەوتێکی ئەسپە کە بریتییە لە بەرزکردنەوەی
دەستو پشووی لایەک پێکەوە
*v.t.* (١) هاتو چوون بە شوێنێکدا؛ پیاسە پیاکردن *( to ~ a room)* .
(٢) بە هەنگاو پیوان (٣) مەشقدادانی ئەسپ لەسەر رەوتێکی تایبەتی
(٤) خێرایی بۆ دانان یا برینەوە
*v.i.* (١) لەسەرخۆ رۆیشتن؛ وورده وورده رۆیشتن؛ پیاسەکردن.
(٢) دەستو پاشووی لایەک پێکەوە بەرزکردنەوە
**put one through his paces,** تاقیکردنەوە توانا، لێهاتوویی؛
**keep pace with,** = keep up with.
**set the pace,** پلەی خێرایی بۆ دانان؛ بریاری پلەی خێرایی بۆ دان
**paced** (pāst), *adj.* (١) بە خێراییەکی تایبەتی رۆیشتن؛
*( fast- ~ )* (٢) بە هەنگاو پێوراو
**pacemaker** (pās'mā kėr), *n.* (١) پلەی خێرایی دانەر (غارغارێن،
پێشبرکێ): سوارێک یا راکەرێکی پێشەنگە کە پلەی خێرایی پێشبرکێیەک
دادەنێ (٢) پێشەنگ (٣) (ا) ئاسونکەی رێکوپێککەری دڵ لێدان
(ب) ئامێری رێکوپێککەری دڵ لێدان (پزیشکەوانی).
**-pacemaking** *(n. & adj.).*
**pacesetter** (pās'set ēr), *n.* pacemaker.
**pacer** (pä'sēr), *n.* (١) ئەسپێکە کە رەوتێکی تایبەتی هەیە
(٢) pacemaker

**pachyderm** (pak'ə-dūrm'), *n.* (١) گیانداری پێست ئەستوورە
وەک فیلو کەرکەدەن. (٢) کەسێکی بێ هەست؛ هەست مردوو.
**pachydermatous** (pak'ə-dūr'mə-təs), *adj.* (١) تایبەتی بە
گیانداری پێست ئەستوور وەک فیلو کەرکەدەن. (٢) بێ هەست؛ هەست مردوو
**Pacific** (pə-sif'ik), *n.* دەریای پاسیفیک.
*adj.* (١) هی دەریای پاسیفیک؛ لە دەریای پاسیفیکدا.
(٢) هی کەناری پاسیفیکی ئەمەریکا.
**pacific** (pə-sif'ik), *adj.* (١) لاشەڕ؛ لاشەڕانی؛ ئاشتکەرەوە؛
ئاشتیخواز. (٢) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ هێواش؛ بە ئاسوودە.
**pacification** (pas'ə-fi-kā'shən), *n.* (١) دڵنەوایی کردن؛
دڵ هێنانەوە جێی خۆ (٢) دامرکاندنەوە؛ دابینکردن؛ کپ کردنەوە.
**pacificism** (pə-sif'ə-siz'm), *n.* = pacifism.
**Pacific Ocean,** ئۆقیانووسی پاسیفیک؛ ئۆقیانووسی هێمن
**pacifier** (pas'ə-fi ēr), *n.* (١) دڵنەواییکەر؛ دڵهێنەرەوە جێی خۆ.
(٢) مەمکەشووشە؛ مەمە
**pacifism** (pas'ə-fiz'm), *n.* ئاشتیخوازی؛ لاشەڕی؛ لاشەڕێتی؛
ئاشەڕانێتی.
**pacifist** (pas'ə-fist), *n.* کەسێکی لاشەڕ؛ ئاشتیخواز
-pacifistic *(adj.).*
**pacify** (pas'ə-fī'), *v.t.* (١) دڵنەوایی کردن؛ دڵ هێنانەوە جێی خۆ؛
دڵخۆش کردن؛ هێنانەوە سەرخۆ؛ هێمن کردنەوە. (٢) ئاسوودەیی خستنەوە؛
ئاسایش خستنەوە؛ دامرکاندنەوە.
**pack** (pak), *n.* (١) کۆڵ؛ گورزە؛ بار؛ بەستەک؛ پریاسکە؛ بەند.
(٢) (ا) دەستە؛ کۆمەڵ؛ چەند *( a ~ of lies)* .
(ب) دەستە کاغەزی یاریو قومار (ج) پاکەت: *( a ~ of cigarettes)*
(د) رەوە؛ گەلە؛ گەل. *( a ~ of wolves)* . (ه) گەلە سەگی راو
(و) تاقم؛ دەستە؛ کۆمەڵ (٣) بەستەڵەکی؛ سەرناوکەوتوو.
(٤) (ا) پێچانەوەی نەخۆش لە بەتانیو متیلەوە.
(ب) ئەو بەتانیو متیلەی کە لە نەخۆشەوە دەپێچرێ (ج) سارغی
(د) خاولی یا بەستەکێک قوماشی پڕ لە سەهۆڵە دەخرێتە سەر ئاوساوییەک:
*( ice ~ )*
(٥) چەند جۆرە دەرمانێکی جوانیی پێستە.
(٦) سەرجەمی خواردەمەنی قوتووکراوی وەرزێکە.
*v.t.* (١) کەلوپەل پێچانەوە (گەشت، گواستنەوە)؛ خۆ کۆکردنەوە؛ کۆکردنەوە
*( He ~ed his bags.)*
(٢) پێچانەوە؛ کردن بە بەستەک.
(٣) کردنە قوتووەوە، تەنەکەوە، یا سنووقەوە (خواردەمەنی)؛ قوتووکردن؛
داگرتن (٤) ئاخنین؛ تێ ئاخنین؛ تەنین (جێ)؛ سیخناخ کردن؛ پڕکردن؛
تێ ترنجاندن: *( The audience ~ed the hall.)*
(٥) گرتن (کون)؛ داگرتنەوە (جێی بەیەک گەیشتنی دوو لوولە):
*( to ~ a joint)* (٦) پەستانەوە؛ پەستنەوە؛ داگرتنەوە: *( ~ed earth)*
(٧) بارکردن (وولاخ)؛ بار لێنان (٨) بار هەڵگرتن (وولاخ).
(٩) هەڵگرتن (چەک): *( He ~s a gun.)* . (١٠) *( ~ off )*، بە پەلە ناردن؛
بە پەلە رەوانەکردن: *( They ~ed him off to school.)* .
(١١) [Slang]، لێدان (مستەکۆڵە)؛ پیاکێشان.
*v.i.* (١) پێچانەوە؛ کۆکردنەوە؛ بەستەک کردن.
(٢) خۆ پێچانەوە (گەشت، گواستنەوە)؛ خۆ کۆکردنەوە؛ کەلوپەل پێچانەوە:
*( Are you going to ~ tonight?)*
(٣) تێ ترنجان؛ قەرەباڵغ کردن؛ تێدا کۆمەڵ بوون
(٤) بە باشی یا بە ئاسانی دەپێچرێتەوە: *( This suit ~s well.)*
(٥) پەسترانەوە؛ داگیرانەوە؛ داگرتنەوە. (٦) بە پەلە رۆیشتن؛ تێ تەقان
*adj.* (١) (ا) بۆ پێچانەوە باشە یا بەکاردێت
(ب) بۆ قوتووکردن باشە یا بەکاردێت.
(٢) بەستەک کراو؛ پەستراوە؛ داگیراوە؛ پێچراوە.
(٣) باربەر؛ بارکێش؛ بارهەڵگر: *( a ~ animal)* .

**pack up.** [Colloq.]. واز له ئیش هێنان؛ پەك کەوتن؛ شکان

**send packing,** لەپڕ دەرکردن (لەبەر ناپەسەندێتی).

**pack** (pak), *v.t.* پڕکردن له لایەنگرانی خۆ (کۆمیتە، ئەنجوومەن، دەستەی سوێندخۆران)؛ زۆر له لایەنگرانی خۆ تیادانان: ***(to ~ a jury)***.

**package** (pak′ij), *n.* (١) پێچانەوە؛ کۆکردنەوە؛ بەستەك کردن؛ قوتووکردن (٢) پریاسکە؛ بەستەك؛ گورزە.

(٣) پێشنیاز یا پێشکەشکەری‌یەکی گشتی: ***( ~ deal)***.

*v.t.* پێچانەوەو ئامادەکردن (بۆ فرۆشتن یا گواستنەوە).

**package deal,** ڕێکەوتنێکی سەوداگەری گشتی‌یە کە بە باش‌و خراپەوە دەبێ هەمووی پەسەند بکرێت.

**pack animal,** وڵاخی بار؛ وڵاخی باری یا باربەر.

**packer** (pak′ẽr), *n.* پێچەرەوە یا داگرەوەی خواردەمەنی‌و شتومەك بۆ فرۆشتن یا هەڵگرتن یا گواستنەوە (کۆفرۆشی)؛ قوتووکەری کۆفرۆش: ***(a meat ~)***

**packet** (pak′it), *n.* (١) پاکەت؛ پریاسکە

(٢) بەلەم یا کەشتی گواستنەوەی ڕێك‌وپێکی گەشتکەرو پۆستەو بار.

**pack ice,** بەستەڵەکی سەرئاوکەوتوو

**packet boat,** بەلەم یا کەشتی گواستنەوەی ڕێك‌وپێکی گەشتکەرو پۆستەو بار

**pack horse,** (١) بارگیر

(٢) کەسێکە کە ئیشی قورس‌و ناخۆش دەکات.

**packing** (pak′iŋ), *n.* (١) داگرتنەوەی خواردەمەنی بۆ ناردنی بۆ بازاڕ؛ قوتووکردن (٢) پڕکردنەوەی برین یا بۆشایی‌یەك بە سارغی.

(٣) (أ) شتی بەکارهێنراو له داگرتنەوەی خواردەمەنیدا

(ب) شتی بەکارهێنراو له پێچانەوەی کەل‌وپەل‌و کەرەسەدا.

**packing box ( or case ),** سنووقی تێکردن‌و داگرتنەوەی خواردەمەنی‌و شتومەك

**packing house,** کارگەی ئامادەکردن‌و کردنە قوتووەوەو داگرتنەوەی گۆشت‌و هەندێ جاریش میوەو سەوزە (هەروەها پێشی دەوترێ " **packing plant** ").

**packman** (pak′mən), *n.* = **peddler.**

**pack rat,** (١) مشکەکوێرەیەکی ئەمریکی‌یە کە هەموو جۆرە شتێك له کونەکەیدا کۆدەکاتەوە (٢) [Slang]، کەسێکە کە هەموو شت کۆدەکاتەوەو هەرگیز هیچ شتێك فڕێ نادات

**packsack** (pak′sak′), *n.* توورەکەی شان؛ جەواڵ

**packsaddle** (pak′sad′′l), *n.* کورتان؛ کۆپان

**packthread** (pak′thred′), *n.* گوش (بۆ پێچانەوەی سنووق‌و شتی تر

**pack train,** کاروانی بار

**pact** (pakt), *n.* پەیمان؛ ڕێکەوتن

**pad** (pad), *n.* تەپەی پێ؛ دەنگی گۆچان یا داردەست کە بەر زەوی دەکەوێت

**pad** (pad), *n.* (١) لبادی ژێر زین؛ لبادی لەبری زین بەکارهێنراو

(٢) دۆشەکەڵە؛ پشتی؛ شتی ئاخنراوی نەرم؛ پاڵپشت؛ ژێرەخەر.

(٣) ئاواخن (بەر جل‌وبەرگ)؛ قەنەواچە ***( a shoulder ~ )***

(٤) (أ) نەرمە گۆشتی لاستیکی ژێر پێی هەندێ گیاندارو باڵندە.

(ب) سمی ئەم جۆرە گیاندارە (ج) شوێن پێی ئەم جۆرە گیاندارە.

(٥) بەشە گۆشتنەکەی ژێر سەری پەنجەی دەست‌و پێ.

(٦) گەڵای پانی سەرئاوکەوتووی ڕووەکی ئاوی.

(٧) پەڕاو؛ دەفتەر (بەتایبەتی کە پەڕەکانی بە ئاسانی لێ بکرێتەوە): ***( a writing ~ )***

(٨) ئیسنەمیا.

(٩) بنکە؛ سەکۆ (بۆ مووشەك فڕێدان، هێلیکۆپتەر نیشتنەوە، دەستپێکردنی کارێك) ***( a launching ~ for revolution; a missle launch ~ : a helicopter ~ )***

(١٠) دەستگر؛ دەزگر؛ پەڕۆ (بۆ شتی گەرم پێ هەڵگرتن)؛ پارچەیەك پەڕۆی ئاخنراوی نەرم‌ونۆڵ.

(١١) [Slang]، (أ) ژوور؛ خانە؛ ماڵ؛ جێ.

(ب) جێی نووستن؛ چەرپایە؛ جێ.

*v.t.* (١) ئاواخن تێخستن؛ ئاخنین؛ بەر تێگرتن (جل‌وبەرگ)

(٢) درێژە پێدان؛ شتی هیچ‌وپووچ تێخستن؛ پڕکردن له شتی هیچ‌وپووچ: ***( to ~ a speech, lecture, article, etc.)***

(٣) بە شتی ساختە یا درۆ پڕکردنەوە (خەرجی)؛ زیادە پێوەنان بۆ قازانجی خۆ ***( to ~ an expence account, payroll, etc.)***

**pad** (pad), *v.i.* (١) بە پێ ڕۆیشتن؛ بە پیادەیی چوون

(٢) بەبێ خشپە ڕۆیشتن یا ڕاکردن؛ بەبێ دەنگ ڕۆیشتن.

**pad** (pad), *n.* (١) ئەسپێکی سست یا هێواش.

(٢) [Rare]، چەتەی پیادە؛ دزی پیادە.

(٣) [British Slang or Dial.]، ڕێگە؛ ڕێ؛ پیادەڕێ.

**padding** (pad′iŋ), *n.* (١) ئاخنین؛ ئاخنینەوە

(٢) ئاواخن (لۆکە، پووش... هتد).

(٣) زیادە پێوەنان (بەتایبەتی له نووسیندا)؛ شتی زیادە پێوەنراوی ناپێویست.

**paddle** (pad′′l), *n.* (١) سەوڵ؛ سەوڵی دەم پانی کورت.

(٢) گەڵاکوتك. (٣) شتێکی وەك سەوڵ: (أ) مقاشی تێکدانی ئاسنی تواوە له کوورەدا. (ب) بێلچە (شووشەکاری) (ج) تەختەداری مامۆستا (بۆ تەمێ کردن یا لێدانی قوتابی) (٤) تەختەداری چەرخی گەردوون یا جەنجەڕی ئاو؛ تەختەداری چەرخی کەشتی‌و بەلەمی هەڵمی. (٥) ڕەکێتی تەنسی سەر مێز

*v.i.* سەوڵ لێدان؛ سەوڵ لێدان لەسەرخۆ.

*v.t.* (١) سەوڵ لێدان (٢) لێدان یا تەمێ کردن (بە تەختە داردەست).

(٣) تێکهەڵدان؛ تێکدان.

-**paddler** *(n.)*.

**paddle one's own canoe,** پشت بە خۆ بەستن؛ ئیش‌وکاری خۆ کردن بە دەستی خۆ.

**paddle** (pad′′l), *v.i.* (١) بە ناو تەنکاودا ڕۆیشتن؛ دەست‌و پێ جووڵاندنەوە له تەنکاودا؛ شڵپە له ئاو هەڵساندن بە ئەسپایی بە دەست یا بە قاچ. (٢) ( ~ **in** ; ~ **on** ; ~ **about** )، یاری پێ کردن.

(٣) بە گەلاوگەڵ ڕۆیشتن وەك منداڵ؛ وەك مراوی ڕۆیشتن.

**paddle boat,** بەلەمی چەرخدار

**paddle fish,** ماسی‌یەکی لمۆز سەوڵی‌یە

**paddle wheel,** چەرخی بەلەم پان پێوەنان؛ چەرخی بەلەم لێخوڕین.

**paddock** (pad′ək), *n.* [Archaic], بۆق؛ قوڕناوێلکە؛ بۆقی زل

**paddock** (pad′ək), *n.* (١) لەوەڕگای ئەسپ له نزیك تاولەوە.

(٢) مەیدانی مەشقی تەنیشت تاوڵەی ئەسپ.

(٣) شوێنی زین کردن‌و ئامادەکردنی ئەسپی غارغارێن پێش غارغارێنەکە

(٤) زەوی پەرژین کراو

*v.t.* کردنە لەوەڕگا یا مەیدانی مەشقەوە.

**paddy** (pad′i), *n.* (١) مەرەزە؛ چەڵتووك.

(٢) گۆلە مەرەزە؛ جاڕە مەرەزە.

**paddy wagon,** [Slang], = **patrol wagon.**

**padlock** (pad′lok′), *n.* قفڵ.

*v.t.* قفڵ لێدان؛ داخستن

**padre** (pä′dri), *n.* (١) قەشە: ناونیشانی قەشەیە له ئیتاڵیاو ئیسپانیاو پورتوغال‌و ئەمریکای لاتینی (٢) [Slang]، قەشەی سوپا.

**padrone** (pə-drō′ni), *n.* (١) سەردار؛ سەرگەورە؛ سەرەك

(٢) خاوەن ئوتێل

(٣) قۆنتەراتچی ئیش دۆزینەوە بۆ کۆچەرە ئیتاڵی‌یەکان له ئەمریکا.

**paean** (pē′ən), *n.* (١) سروودی سوپاسنامە بۆ خواکانی یۆنانی کۆن.

(٢) سروودی شادی‌و سەرکەوتن.

**pagan** (pā′gən), *n. & adj.* کافر؛ بت پەرست؛ بێ ئایین؛ خوانەپەرست.

**pagandom** (pā′gən-dəm), *n.* (١) کافران؛ بت پەرستان.

(۲) کافرستان؛ شوێنی کافران یا بت پەرستان.

**paganism** (pā′gən-iz′m), *n.* (۱) کافری؛ بت پەرستی؛ بێ ئاینی.

(۲) خوونەریت و بیروڕای کافران.

**paganize** (pä′gən-iz′), *v.t.* کردن بە کافر

*v.i.* بوون بە کافر

**page** (pāj), *n.* (۱) (ا) لاپەڕە؛ پەڕە *( tearing out a ~ )*.

(ب) نووسراوی سەر لاپەڕەیەك.

(۲) ( *pl* ) تۆمارنامە؛ نووسراو: *( the ~s of history)*.

(۳) ڕووداو؛ چەند ڕووداوێك؛ زنجیرەیەك ڕووداو؛ ئەڵقە:

*( a colorful ~ in his life)*

(٤) چاپی ئامادەکراو بۆ لە چاپدانی لاپەڕەیەك.

*v.t.* ژمارە دانان لەسەر لاپەڕەکانی کتێب یا دەفتەرێك.

**page** (pāj), *n.* (۱) شاگردی سوارچاکی سەدانی ناوەڕاست (بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ بوون بە سوارچاك). (۲) بەردەستی پیاوێکی گەورە.

(۳) هەرزەی بەردەستی میوانخانەو فەرمانگە (بۆ نامەبەری و نیشی سەرپێیی).

(٤) بەردەستی پەرلەمان یا کۆنگرێس (بۆ نامەبەری و کاری سەرپێیی).

*v.t.* (۱) بەردەستی کردن.

(۲) بانگ کردن بە بڵندگۆ؛ دۆزینەوەی کەسێك بە بانگ کردنی بە بڵندگۆ لە شوێنێکی وەك فرۆکەخانەدا: *( to ~ a person)*

*v.i.* بەردەستی کردن

**pageant** (paj′ənt), *n.* (۱) (ا) بەردەیەکی شانۆنامەی ئاینی.

(ب) شانۆی سەردەمی شانۆنامەی ئاینی.

(۲) ئاهەنگی نواندنی سەر شەقام؛ نوانڕۆیی ئەسپ سواران؛ نوانڕۆیی ڕازاوە؛ ڕێ ڕۆیشتنێکی ڕازاوەو خۆشی

(۳) ئاهەنگی نواندنی سەر شانۆ بە جلی هەمەڕەنگەوە.

(٤) نواندنی بە تەنتەنەو کەش و فش و بۆش.

**pageantry** (paj′ən-tri), *n.* (۱) ئاهەنگی نواندنی سەر شەقامەکان؛ نوانڕۆیی ڕازاوە (۲) نواندنێکی زۆر جوان؛ دیمەنی خۆ نواندنێکی جوان و ڕازاوە (۳) نواندنێکی بە تەنتەنەو کەش و فش و بۆش.

**paginal** (paj′ə-n′l), *adj.* (۱) لاپەڕەیی؛ هی لاپەڕە

(۲) لاپەڕە بە لاپەڕە *( ~ facsimile)*

**paginate** (paj′ə-nāt′), *v.t.* ژمارە دانان لەسەر لاپەڕەکانی کتێب یا دەفتەر

**pagination** (paj′ə-nā′shən), *n.* (۱) ژمارە لەسەر دانانی لاپەڕەکانی کتێب یا دەفتەر؛ ژمارە لەسەر دانران (۲) (ا) ئەو ژمارانەی لەسەر لاپەڕەکانی کتێب یا دەفتەر دادەنرێت. (ب) سەرجەمی ژمارەی لاپەڕەکانی کتێب یا دەفتەر هەروەها ڕێکخستنیان

**pagoda** (pə-gō′də), *n.* پاگۆدە پەرستگایەکی چەند نهۆمی هیندی و چینی و یابانییە

**Pahlavi** (pä′lə-vē′), *n.* پەهلەوی زمانی فارسی کۆن

**pahlavi** (pä′lə-vē′), *n.* پارەیەکی زێڕی ئێرانییە

**paid** (pād), *past tense and past participle of* pay.

*adj.* (۱) بە کرێ گیراو؛ مووچەخۆر: *( a ~ advisor)*.

(۲) ( ~ up ; ~ out )، دراوەتەوە (قەرز).

**pail** (pāl), *n.* (۱) سەتڵ (۲) پڕ سەتڵێك؛ سەتڵێك

**pailful** (pāl′fool′), *n.* پڕ سەتڵێك؛ سەتڵێك

**paillasse** (pal-yas′, pal′yas), *n. Also* palliasse. دۆشەکی پووش یا ئاردەمشار

**paillette** (pal-yet′), *n.* پوولەکە؛ زڕو زنگیانە؛ موورووو

**pain** (pān), *n.* (۱) سزا (۲) ئێش؛ ئازار؛ ئاسۆر؛ گل؛ ژان.

(۳) دەردی سەری؛ ناخۆشی؛ سەرئێشە؛ سوێ

(٤) ( *pl* ) ژانی منداڵبوون؛ ژان

(٥) ( *pl* ). هەوڵ و تەقەلای زۆر؛ بە تەنگەوە هاتنی زۆر؛ ڕەنج دان؛ ڕەنج:

*( He took ~s with his work.)*

*v.t.* ئازاردان؛ ئێش و ئازار پێدان؛ سوێ کردن بە دڵەوە؛ تووشی دەردی سەری کردن.

**on ( or upon, under ) pain of,** بە مەترسی سزادرانێکی تایبەتییەوە؛ سزایەکی تایبەتی دەدرێ ئەگەر کارێك بکرێ یا نەکرێ:

*( under pain of death)*

**pained** (pānd), *adj.* پەست؛ دڵگیربوو؛ دڵگیر؛ زویر؛ دڵ شکاو.

**painful** (pān′fəl), *adj.* (۱) ئازاربەخش؛ ئازاردەر؛ بەسوێ.

(۲) بەئازار؛ بە ئێش و ئازار؛ بەئاسۆر: *( a ~ finger)*

(۳) ناخۆش: *( a ~ decision)*. (٤) [Archaic]، قورس؛ گران.

**painkiller** (pān′kil′ēr), *n.* [Colloq.], ئازارکوژ؛ ئازارشکێن.

**painless** (pān′lis), *adj.* (۱) بێ ئازار؛ بێ ئێش.

(۲) نابێتە هۆی ئێش و ئازار.

**painstaking** (pānz′tāk′iŋ), *n.* هەوڵدان؛ هەوڵ؛ ڕەنج دان؛ ووردی و ووریایی لە ئیش و کاردا.

*adj.* (۱) پێویست بە هەوڵ و ووردی و کۆشش و بەتەنگەوە هاتن دەکات؛ گران: *( ~ work)*. (۲) زۆر کۆششکەر؛ هەوڵدەر؛ ڕەنجدەر؛ ئیشکەری باش و گران: *( a ~ carpenter)*.

**paint** (pānt), *v.t.* (۱) دیمەن کێشان؛ وێنەکێشان؛ نیگارکێشان.

*( He ~ed a landscape.)*

(۲) بە ڕوونی باسکردن:

*( He ~ed a bleak picture of the political situation.)*

(۳) بۆیەکردن: *( He ~ed the walls.)*

(٤) ئارایشت کردن؛ جوانکردن؛ ڕازاندنەوە (بە ڕەنگ یا بۆیە)؛ ڕووکەش کردن.

*v.i.* (۱) دیمەن کێشان؛ وێنەکێشان؛ نیگار درووستکردن.

(۲) ئارایشت کردن؛ ئارایشت بەکارهێنان.

*n.* (۱) بۆیە؛ بۆیاخ؛ ڕەنگ. (۲) بۆیەی ووشکەوە بوو. (۳) ئارایشت.

paint out, بە بۆیە داپۆشین؛ بۆیەکردن و داپۆشین.

**paintbrush** (pānt′brush′), *n.* فڵچەی بۆیەچی؛ فڵچەی نیگارکێش.

**painted** (pān′tid), *adj.* (۱) نیگار کێشراو؛ وێنە کێشراو.

(۲) بۆیەکراو.

(۳) درۆ؛ درۆزنە؛ ڕووالەت؛ هەر بە سەرزاری: *( ~ expressions)*

(٤) زەق؛ لە ئەندازە بەدەر ڕەنگاوڕەنگ. (٥) لە ئەندازە بەدەر ئارایشت کراو.

**painter** (pān′tēr), *n.* (۱) نیگارکێش؛ وێنەکێش؛ هونەرمەند

(۲) بۆیەچی.

**painter** (pān′tēr), *n.* گوریسی بەستنەوەی بەلەم لە بەندەردا.

**painter** (pān′tēr), *n.* [Dial.], پڵنگی ئەمەریکی.

**painting** (pān′tiŋ), *n.* (۱) بۆیەچێتی.

(۲) نیگارکێشی؛ وێنەکێشی؛ نیگارکێشان. (۳) تابلۆ.

**pair** (pâr), *n.* (۱) جووت: *( a ~ of shoes, socks, gloves, etc.)*.

(۲) شتێکی دوولا یا دوو پەل کە پێکەوە بەکاردەهێنرێ: *( a ~ of pants ; a ~ of scissors)*

(۳) جووتە ئادەمیزاد یا گیاندار: (ا) ژن و پیاو؛ جووتە دڵدار؛ جووتە دەزگیران.

(ب) جووتە باڵندە یا گیانداری نێرومێ

(ج) جووتێ کەسی هاوڕێ یا هاوبیروباوەڕ: *( a ~ of rascals)*.

(د) جووتە ئەسپی گالیسکە. (ه) دوو ئەندامی بیروباوەڕو حیزب جیاواز کە ڕێك دەکەون دەنگ نەدەن لەسەر گەڵاڵەی یاسایەکی تایبەتی. (و) ئەم ڕێکەوتنە

(٤) دوو کاغەزی چوونیەك لە دەستەکاغەزی قوماردا.

(٥) [Rare or Dial.]، دوو: *( a ~ of stairs)*.

*v.t.* (۱) جووت کردن؛ جووت جووت کردن.

(۲) جووت پێ گرتن؛ لە یەك چاك کردن.

(۳) هاوجووت بۆ دۆزینەوە؛ هاوبەش بۆ پەیداکردن.

*v.i.* (۱) ( ~ off )، جووت گرتن؛ بوون بە جووت یا جووتە.

(۲) مارەکردن؛ ژنهێنان؛ شوو پێ کردن؛ بوون بە هاوسەر.

pair off, (۱) جووت پێ گرتن؛ جووت جووت کردن؛ جووت کردن.

(۲) جووت گرتن و ڕۆیشتن؛ جووت جووت بوون و کشانەوە.

**paisley** (pāz′li), *adj.* (۱) هی قوماشێکی خوری نەقش و نیگاراوی

ڕەنگاوڕەنگە. (٢) لەم جۆرە قوماشە درووستکراوە

*n.* (١) قوماشی خوری ڕەنگاوڕەنگی نەقش‌ونیگاراوی؛ شاڵ.

(٢) دەستماڵ یا جل‌وبەرگی تری لەم قوماشە درووستکراو.

**pajamas** (pə-jam′əz, pə-jä′məz), *n.pl.* بیجامە.

**pal** (pal), *n.* [Colloq.]. برادەر؛ هاورێ.

*v.t. & v.i.* [Colloq.]. بوون بە هاورێ؛ برادەری کردن.

**palace** (pal′is), *n.* (١) کۆشکی شاهانە؛ کۆشك.

(٢) خانوویەکی زۆر گەورەو جوان.

(٣) خانوویەکی گەورەو جوانی پیشانگاو خۆنواندن.

**paladin** (pal′ə-din), *n.* (١) یەکێك لە دوانزە سوارچاکە بەگزادەکەی " شارلەمان ". (٢) پاڵەوان؛ قارەمان؛ سوارچاك.

**palaestra** (pə-les′trə), *n.* (١) وەرزشگا (بەتایبەتی هی زۆرانبازی لە یۆنانی کۆند). (٢) (ا) قوتابخانەی زۆرانبازی.

(ب) جیمنازیۆم؛ وەرزشگا؛ مەشقگا.

**palanquin, palankeen** (pal′ən-kēn′), *n.* کەژاوە (کە دوو کەس بە شان هەڵیان گرتبێت)

**palatability** (pal′i-tə-bil′ə-ti), *n.* (١) تام خۆشی؛ خۆشێتی.

(٢) پەسەندێتی؛ بەجێیی؛ بەدڵ بوون.

**palatable** (pal′i-tə-b′l), *adj.* (١) تام خۆش؛ خۆش؛ دەخورێت.

(٢) پەسەند؛ بەجێ؛ بەدڵ بوو؛ جێی ڕەزامەندی‌و پەسەندە.

**palatal** (pal′i-t′l), *adj.* (١) هی ئاسمانەی دەم؛ هی مەلاشوو؛ هی دەم.

(٢) بە بەرکەوتنی سەری زمان‌و ئاسمانەی دەم دەبێژرێ وەك دەنگی " چ " و " ش " (دەنگناسی)؛ مەلاشوویی.

**palatalize** (pal′i-t′l-īz′), *v.t.* گۆڕین بۆ دەنگێکی وەها کە بە بەرکەوتنی سەری زمان‌و ئاسمانەی دەم دەبێژرێ.

**palate** (pal′it), *n.* (١) ئاسمانەی دەم؛ مەلاشوو

(٢) هەستی چەشتن؛ چەشتن؛ هەستی تام کردن.

(٣) چێژی مێشك‌و دڵ؛ هەستی بەدڵ بوون‌و پەسەندکردن.

**palatial** (pə-lā′shəl), *adj.* (١) بۆ کۆشك دەشێت:

*( ~ gardens)*

(٢) زۆر گەورەو جوان‌و ڕازاوە؛ لە کۆشك دەچێ؛ زۆر جوان‌و کەشخە (خانوو):

*( a ~ house)*

**palatinate** (pə-lat′′n-āt′, pə-lat′′n-it), *n.* (١) هەرێمی ژێردەستی دەرەبەگێکی گەورە (٢) پلەوپایەی میرێکی دەرەبەگی.

(٣) [P-]. دانیشتووی هەرێمێکی ئەڵمانیا کە بە " پەلاتین " ناسراوە.

**palatine** (pal′ə-tīn′, pal′ə-tin), *adj.* (١) کۆشکی

(٢) مافی شاهانەی هەیە. (٣) تایبەتی بە میر یا بەگزادە.

*n.* (١) کاربەدەستی کۆشکی شاهەنشا.

(٢) دەرەبەگێکی سەدانی ناوەڕاست کە وەك پاشا هەرێمەکەی خۆی دەبڕان.

(٣) کەوڵی سەرشان

(٤) [P-]. یەکێکە لەو حەوت گردەی ڕۆمای لەسەر درووستکراوە.

(٥) [P-]. دانیشتوویەکی هەرێمی " پەلاتین " ی ئەڵمانی.

**palatine** (pal′ə-tīn′, pal′ə-tin), *adj.* هی ئاسمانەی دەم؛ مەلاشوویی

*n.* ئێسقانی ئاسمانەی دەم.

**palaver** (pə-lav′ẽr), *n.* (١) کۆڕی خێڵە ئەفەریقایی‌یەکان؛ کۆڕی نێوان خێڵە ئەفەریقایی‌یەکان‌و بازرگان‌و کەسانی ئەورووپایی تر لە ئەفەریقادا (٢) دەمەتەقێ؛ قسە. (٣) مەرایی؛ زمان لووسی.

*v.t. & v.i.* مەرایی کردن؛ زمان لووسی کردن.

**pale** (pāl), *adj.* (١) ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاو؛ ڕەنگ سپی هەڵگەڕاو؛ ڕەنگ پەڕیو *( to turn ~ )* . (٢) بێ ڕەنگ؛ کز (ڕووناکی).

(٣) بێ هێز؛ بێ تین.

*v.i.* (١) ڕەنگ زەرد بوون؛ ڕەنگ سپی هەڵگەڕان؛ ڕەنگ پەڕین.

(٢) کز دیاربوون؛ ناگرنگ‌و هیچ‌وپووچ دیاربوون لەچاو شتێکی تردا:

*( My work ~d beside his.)*

*v.t.* ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاندن؛ کزکردن.

-paleness *(n.).*

**pale** (pāl), *n.* (١) سنگ (تەیمان)؛ قیسپ

(٢) پەرژین؛ تەیمان؛ سنوور: *( outside the ~ of the law)* .

(٣) شوێنێکی پەرژین کراو

(٤) میلی ستوونی ناوەڕاستی قەڵغان.

**beyond the pale,** لە سنووری ڕەفتار جوانی بەدەر.

**pale- , palae-** (pā′li), **paleo-.**

**paleethnology** (pā′li-eth-nol′ə-ji), *n.* ڕەگەزی کۆن ناسی؛ لێکۆڵینەوەی ڕەگەزە کۆنەکانی بەر لە مێژوو.

**paleo-** (pā′li-ō), *Also* **pale- , palae-,** پێشگرێکە بەمانای: (ا) کۆن؛ بەر لە مێژوو. (ب) سەرەتایی؛ کێوی.

**paleobotany** (pā′li-ō-bot′ə-ni), *n.* لێکۆڵینەوەی ڕووەکە بەردەنی‌یەکان؛ زانستی ڕووەکی وەك بەرد لێهاتوو.

**paleography** (pā′li-og′rə-fi), *n.* (١) نووسینی کۆن؛ نووسینە کۆنەکان (وەك نووسینی بزماری). (٢) لێکۆڵینەوەی نووسین‌و نووسراوە کۆنەکان ؛ هەڵهێنان یا دەرکردن‌و خوێندنەوەو باسکردنی نووسراوە کۆنەکان

**-paleographic; paleographical** *(adj.)*; **paleographer** *(n.).*

**paleolith** (pā′li-ə-lith′), *n.* ئامێری بەردینی کۆن.

**paleolithic** (pā′li-ə-lith′ik), *adj.* تایبەتی بە دەوری بەرد.

**paleolithic man,** مرۆڤی دەوری بەرد.

**paleontology** (pā′li-ən-tol′ə-ji), *n.* (١) زانستی پاشماوە بەردینەکانی گیاندارو ڕووەکی کۆن (زەمیناسی)؛ لێکۆڵینەوەی بوونەوەری زۆر کۆن. (٢) ڕاپۆرتێکی نووسراو دەربارەی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

**-paleontological** *(adj.)*; **paleontologist** *(n.).*

**Paleozoic** (pā′li-ə-zō′ik), *adj.* (١) هی چەرخە زۆر کۆنەکان (زەمیناسی). (٢) هی بەردی ئەم چەرخە.

**paleozoology** (pā′li-ō-zō-ol′ə-ji), *n.* زانستی پاشماوە بەردینەکانی گیاندارو جانەوەری کۆن (زەمیناسی).

**-paleozoological** *(adj.).*

**Palestinian** (pal′əs-tin′i-ən, pal′əs-tin′yən), *adj. & n.* فەڵەستینی.

**palette** (pal′it), *n.* (١) تەختەیەکە نیگارکێش بۆیەکانی لەسەر تێکەڵاو دەکات‌و ڕێك دەخات. (٢) ڕەنگی بەکارهێنراو لەلایەن نیگارکێشێکی تایبەتی‌یەوە؛ ڕەنگی تابلۆیەکی تایبەتی.

**palette knife,** چەقۆی کوڵ تێکەڵاوکردنی بۆیەی نیگارکێش.

**palfrey** (pôl′fri), *n.* [Archaic]. ئەسپێکی بچووکە ژن سواری دەبێ.

**palimpsest** (pal′imp-sest′), *n.* پێست یا تەختەبەردێکە کە دوو- سێ جار شتی لەسەر نووسرابێ‌و کوژێنرابێتەوە، بەڵام هەندێ لە نووسینە کۆنەکەی هێشتا هەر پێوە دیاربێت

**palindrome** (pal′in-drōm′), *n.* ووشەیەك یا ڕستەیەك یا ژمارەیەکە کە لە پێشەوەو دواوە دەخوێنرێتەوە بەبێ گۆڕینی ماناکەی:

**( madam; rotator; Able was I ere I saw Elba.; 1441)**

**paling** (pā′liŋ), *n.* (١) تەیمان درووستکردن؛ تەیمان کردن.

(٢) تەیمان. (٣) قیسپ؛ سنگ (تەیمان)

**palingenesis** (pal′in-jen′ə-sis), *n.* (١) لەدایکبوونەوە؛ زیندووبوونەوە. (٢) زیندووبوونەوەی گیانی مردوو لە لەشێکی تری زیندوودا.

(٣) گۆڕانی تەواوی جانەوەر لەکاتی گەورەبوونیدا.

**palinode** (pal′ə-nōd′), *n.* (١) هەڵبەستی پاشگەزی؛ هەڵبەستێکە کە هۆنەر تێیدا پاشگەز دەبێتەوە لە هەڵبەستێکی پێشوو. (٢) پاشگەزبوونەوە

**palisade** (pal′ə-sād′), *n.* (١) سنگی ئەستووری نووك تیژ.

(٢) تەیمانی سنگی ئەستووری نووك تیژ بۆ پاراستن.

(٣) *(pl.)*، ڕیزە کەندەڵانی بەرزو زۆر لێژی قەراغ ڕووبار

*v.t.* بەهێزکردن‌و پاراستن بە تەیمانی سنگی ئەستوورو نووك تیژ.

**palish** (pāl′ish), *adj.* ئەختێك ڕەنگ سپی هەڵگەڕاو؛

ئەختێك ڕەنگ زەرد

**pall** (pôl), *v.t.* لەبەرچاو خستن؛ بێ تاقەت کردن؛ پەستکردن.

*v.i.* (١) سست بوون؛ بێ تاقەت بوون؛ ماندووبوون.
(٢) لەبەرچاوکەوتن (لەبەر زۆری)؛ تاقەت لێ چوون

**pall** (pôl), *n.* (١) پەردەی دارتەرم؛ تارای تەرم.
(٢) پەردەیەکی ڕەشی دڵتەنگکەری ناشرین *( a ~ of smoke)*
(٣) [Obs.] (٤) [Obs.]، پەردە؛ پۆشاك، عەبا.
(٥) (ئ) تارای کاسەی شەرابی پیرۆزی کڵێسە (ب) تارای قوربانیگای کڵێسە.

*v.t.* پەردە بەسەردادان؛ داپۆشین بە پەردە.

**Palladian** (pə-lā′di-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە "پالاس ئەسینا" کە بانووخوای ژیری بوو لای یۆنانەکان. (٢) هی ژیری و زانیاری.

**Palladium** (pə-lā′di-əm), *n.* (١) پەیکەری بانووخوای ژیری "پالاس ئەسینا" لە یۆنان و ڕۆما (بەتایبەتی پەیکەرەکەی شاری "ترۆی" کە گوایە شارەکەی دەپاراست). (٢) [P-] شتێکە کە پاراستنی شوێنێك یا لەسەر بەدە؛ پارێزەر؛ قەڵا

**palladium** (pə-lā′di-əm), *n.* ماددەیەکی کیمیایی زیویە لە توخمی پلاتین

**Pallas** (pal′əs), *n.* (١) ناوی بانووخوای ژیری یۆنانی کۆنە
(٢) یەکێکە لە ئەستێرە کاروانیە بچووکەکانی نێوان "مەریخ و موشتەری".

**pallbearer** (pôl′bâr′ēr), *n.* تەرم هەڵگر؛ دارتەرم هەڵگر.

**pallet** (pal′it), *n.* (١) ماڵەی گۆزەودیزە کەر؛ ماڵەی ساف کردن
(٢) palette (٣) تەختەی شت لەسەر دانان یا شت پێ گواستنەوە.
(٤) ئامێری چاپکردن لەسەر بەرگی کتێب. (٥) چەکوشی کاتژمێر.

**pallet** (pal′it), *n.* دۆشەکی پووش؛ جێی پووش؛ گەنگەجێ؛ جێی هیچ‌وپووچ

**pallet** (pal′it), *n.* میلی سنووری سەر قەڵغان

**pallette** (pal′it), *n.* تەبەقی ژێر باڵی قەڵغان

**palliasse** (pal-yas′, pal′yas), *n.* = paillasse.

**palliate** (pal′i-āt′), *v.t.* (١) لە ئازار کەم کردنەوە؛ ئازار کوشتن؛ لە توندوتیژی کەم کردنەوە (٢) بەهانە بۆ هێنانەوەی تاوان؛ لە ستەمکاری-تاوانێك کەم کردنەوە بە بەهانە بۆ هێنانەوەی

**palliative** (pal′i-ā′tiv, pal′i-ə-tiv), *adj.* هی ئازار یا ستەم کەم کردنەوە

*n.* ئازارمرێن؛ ئێش کوژ؛ ستەم کەمکەرەوە.

**pallid** (pal′id), *adj.* ڕەنگ زەرد؛ ڕەنگ پێ نەماو؛ بێ ڕەنگ.
*( the ~ face of an invalid)*

**pallium** (pal′i-əm), *n.* (١) کەوایەکی پیاوانەی یۆنانی کۆنە
(٢) توێکی مێشك (٣) عەبای پاپا و سەرەك قەشە (٤) توێك یا ڕیشاڵی تەنیشت قاوغی هەندێ گیانداری ئاوی؛ بەرگی ناو قاوغی ئەم گیاندارانە.

**pall-mall** (pel′mel′), *n.* (١) پۆل مۆل یارییەکی کۆنە بریتییە لە لێدانی تۆپێکی دارین بە مێکوتێك و خستنییە ناو ئەڵقەیەکی ئاسنینی هەڵواسراو بەوسەری کۆڵانێکەوە. (٢) ئەو کۆڵانەی یارییەکی وەهای تێدا بکرێ.

**pallor** (pal′ēr), *n.* ڕەنگ زەردیی دەموچاو؛ بێ ڕەنگی

**palm** (päm), *n.* (١) دارخورما
(٢) گەڵای دارخورما کە نیشانەی سەرکەوتنە (٣) سەرکەوتن؛ زاڵبوون.
(٤) مەدالیایەکی خەڵاتی سوپایە لە شێوەی گەڵای دارخورمادا

**bear ( or carry off ) the palm,** بردنەوە؛ سەرکەوتن؛ خەڵات کران.

**yield the palm to,** دان بە دۆڕاندندا نان؛ دان بە سەرکەوتنی هاوچاودا نان؛ پێ لە بەرزی نان

**palm** (päm), *n.* (١) بەری لەپ؛ بەری دەست؛ لەپ؛ ناو لەپ؛ ناو دەست.
(٢) بەری لەپی دەستکێش (٣) پانایی شاخی ئاسك و مەڕەکێوی.
(٤) بست؛ پانایی بەری لەپ (پێوان)
(٥) دەمی سەوڵ؛ سەرە پانەکەی شتی تری وەك سەوڵ

*v.t.* (١) شاردنەوە لە بەری لەپدا. (٢) بەری دەست لێدان

**grease the palm of,** بەرتیل پێدان

**have an itching palm** [Colloq.], بەری دەست خوران بۆ پارە؛ زۆر حەز لە پارە کردن؛ زۆر برسی پارە بوون.

**palm off,** بە ساختە بردنەسەر؛ بە درۆ بردنەسەر یا خۆ پەڕاندنەوە.

**palmar** (pal′mēr), *adj.* وەك بەری لەپ؛ لە بەری دەستدا؛ هی بەری لەپ یا سمی گیاندار.

**palmary** (pal′mə-ri), *adj.* زۆر لێهاتوو؛ سەرکەوتوو.

**palmate** (pal′māt, pal′mit), *adj.* وەك بەری دەست وایە بەکراوەیی؛ (ا) وەك هەندێ گەڵا. (ب) قاچی پەردەداری گیانداری ئاوی

**palmer** (päm′ēr), *n.* (١) حاجییەك کە گەڵایەکی دارخورمای هەڵدەگرت نیشانەی ئەوەی کە حەجی کردووە لە "ئەرزی پیرۆز" لە سەدانی ناوەڕاستدا لە ئەورووپا. (٢) حاجی. (٣) palmer worm .

**palmer worm,** (١) جۆرە تەتەڵەمیرانێکی زیانبەخشە بۆ ڕووەك.
(٢) جۆرە کرمۆکەیەکە گەڵای دارسێو دەخوات.

**palmetto** (pal-met′ō), *n.* جۆرە داخورمایەکی بچووکی گەڵا باوەشێنییە.

**palmist** (päm′ist), *n.* فاڵگر؛ فاڵگرەوە؛ دەستگرەوە.

**palmistry** (päm′is-tri), *n.* دەستگرتنەوە؛ فاڵگرتنەوە؛ فاڵ.

**palm leaf,** گەڵای باوەشێنی دارخورمای بچووك (باوەشێن و کڵاوی لێ درووست دەکرێت).

**palm oil,** ڕۆنی دارخورما.

**palmy** (päm′i), *adj.* (١) پڕ لە دارخورما؛ دارخورما سێبەری بەسەردا داوە. (٢) دارخورمایی. (٣) سەرکەوتوو؛ زاڵ؛ گەشەکردوو: *( ~ days)* .

**palmyra** (pal-mī′rə), *n.* دارخورمایەکی گەڵا باوەشێنی پانی هیندییە.

**palomino** (pal′ə-mē′nō), *n.* ئەسپی (عەرەبی) شێ یا بۆری کلك و یاڵ زیوی.

**palp** (palp), *n.* = palpus.

**palpable** (pal′pə-b′l), *adj.* (١) بە دەست دەگیرێ؛ بە ئاسانی هەستی پێ دەکرێ. (٢) دیار؛ ڕوون؛ ئاشکرا.

-palpability *(n.).*

**palpate** (pal′pāt), *v.t.* بە دەست تاقیکردنەوە (پزیشکەوانی)؛ بە دەست پشکنین.

-palpation *(n.).*

**palpebral** (pal′pə-brəl), *adj.* هی برژانگی چاو.

**palpitant** (pal′pə-tənt), *adj.* لەرزیو؛ لێدەر (دڵ، دەمار)؛ پلدەر؛ پرتەپرتکەر.

**palpitate** (pal′pə-tāt′), *v.i.* (١) پرتەپرت کردن (دڵ)؛ پلدان؛ خێرا لێدان (دڵ)؛ دڵەکوتێ کردن. (٢) لەرزین.

**palpitation** (pal′pə-tā′shən), *n.* (١) دڵەکوتێ؛ دڵ خێرا لێدان؛ پرتەپرتی دڵ؛ پلدان. (٢) لەرزین؛ لەرزەلەرز.

**palpus** (pal′pəs), *n.* شاخی هەستیاری تەنیشت دەمی جانەوەر.

**palsied** (pôl′zid), *adj.* گۆج؛ پەککەوتوو؛ سڕ.

**palsy** (pôl′zi), *n.* گۆجی؛ ئیفلیجی یا پەککەوتنی ئەندامێکی لەش (هەندێ جار بە لەرزینەوە).

*v.t.* (١) گۆج کردن؛ ئیفلیج کردن؛ سڕکردن؛ ووشك کردن.
(٢) پەکخستن (بەترساندن)؛ هێز لێ برین.

**palter** (pôl′tēr), *v.i.* (١) دووزمانی کردن؛ درۆکردن؛ جامبازی کردن؛ خۆ بەدەستەوە نەدان؛ تەڵەکەبازی کردن.
(٢) بە سووك دانەبەر؛ بە هیچ‌وپووچ دانان؛ گاڵتەپێهاتن.
(٣) چەندوچوون کردن لەسەر نرخ؛ سەوداگەری کردن.

**paltriness** (pôl′tri-nis), *n.* کەمی؛ هیچ‌وپووچی؛ بێ نرخی؛ بێ بایەخی.

**paltry** (pôl′tri), *adj.* کەم؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ؛ بێ بایەخ.

**paludal** (pə-lōō′d'l, pal′yoo-d'l), *adj.* (١) زەلکاوی؛ زۆنگاوی.
(٢) لە زەلکاوەوە تووش دەبێ (وەك نەخۆشی مەلاریا).

**paludism** (pal′yoo-diz′m), *n.* مەلاریا؛ لەرزوتا

**pampas** (pam′pəz), *n.pl.* دەشتی زۆر گەورەی بە گیا داپۆشراوی
بێ دارودرەختی ئەمەریکای لاتینی بەتایبەتی ئەرجەنتین.

**pampas grass,** گیایەکی بەرزە لە زەل دەچێ گوڵێکی ڕیشاڵیی
زەردکاری هەیە لە پرچی ئافرەت دەچێ.

**pampean** (pam′pi-ən, pam-pē′ən), *adj.* تایبەت بە دەشتە
فراوانەکانی ئەمەریکای لاتینی و دانیشتووە هیندییەکانی.

**pamper** (pam′pēr), *v.t.* (١) خواردن زۆر پێدان؛ زۆر تێرکردن.
(٢) نازکێشان؛ زۆر بەدەمەوەدان؛ جڵەو بۆ بەرەڵاکردن:
*( He ~s the child.)*

**pamphlet** (pam′flit), *n.* (١) نامیلکە؛ بڵاونامە.
(٢) ووتاری ناو نامیلکەیەک (کە بەزۆری لەبارەی باسێکی هاوچەرخەوەیە).

**pamphleteer** (pam′fli-tēr′), *n.* نامیلکەنووس؛
نامیلکە بڵاوکەرەوە؛ ووتارنووسی نامیلکە.

*v.i.* نامیلکە بڵاوکردنەوە؛ نامیلکە نووسین؛ ووتار نووسین بۆ نامیلکەیەک.

**Pan** (pan), *n.* خودای لەوەڕگاو دارستان و گیانداری کێوی و ئاژەڵ و
شوان کە لاق و کلک و شاخی وەک هی بزنە و قەدیشی وەک ئادەمیزاد (ئەفسانەی
یۆنانی)

**pan** (pan), *n.* (١) تاوە؛ مەنجەڵۆکە؛ قاپلەمە *( frying ~ )*.
(٢) (ا) دەفری شۆردنەوە و پاککردنەوەی زێڕی خاو. (ب) تای تەرازوو.
(٣) پڕ تاوەیەک؛ پڕ مەنجەڵۆکەیەک. (٤) چاڵایی؛ نزمایی. (٥) زەوی ڕەق.
(٦) پارچە سەهۆڵی سەرئاوکەوتوو. (٧) بارووتخانەی تفەنگ و دەمانچەی کۆن.
(٨) [Slang]. دەموچاو؛ ڕووخسار

*v.t.* (١) لە تاوەدا سوورکردنەوە؛ لە مەنجەڵۆکەدا لێنان
(٢) [Colloq.]. پەسەند نەکردن؛ ڕەخنەلێگرتن.
(٣) جیاکردنەوەی زێڕی خاو لە زیخ و لم بە شۆردنەوەی.

*v.i.* (١) زیخ و لم شۆردنەوە بۆ جیاکردنەوەی زێڕی خاو.
(٢) زێڕ دەستکەوتن.

**pan out,** (١) زێڕ هێنانە بەرهەم؛ زێڕ دەستکەوتن.
(٢) [Colloq.]، ڕوودان؛ هاتنەدی. (٣) [Colloq.]، سەرگرتن؛ سەرکەوتن.

**pan** (pän), *n.* (١) گەڵای دارێکە لە توخمی دارخورما.
(٢) ماددەیەکە لەم گەڵایە دەردەهێنرێ بۆ جوین.

**pan** (pan), *v.t. & v.i.* جووڵانی کامێرا بۆ وەرگرتنی فیلمی تەلەفزیۆنی
یا سینەمایی

**pan-** (pan), پێشگرێکە بەمانای: (١) گشت؛ هەموو: *(pantheism)*.
(٢) [P-] (ا): گشتگرەوە؛ هەموو دەگرێتەوە: *( Pan-American)*.
(ب) ڕێرەوی یەکێتی و هاوکاری هەموو: *( Pan-Americanism)*.

**panacea** (pan′ə-sē′ə), *n.* دەرمانی هەموو دەردێک

**panache** (pə-nash′, pə-näsh′), *n.* (١) پەڕی لە تەپلە دراو
(٢) ڕەووشت جوانی؛ بێ باکی؛ پۆز؛ قۆزی؛ کەشخەیی.

**Pan-American** (pan′ə-mer′ə-kən), *adj.* تایبەت بە ئەمەریکای
سەروو، خواروو، ناوەڕاست و گەلەکانیان.

**Pan-Americanism** (pan′ə-mer′ə-kən-iz′m), *n.* هاوکاری
ئابووری و ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و کلتووری نێوان ئەمەریکای سەروو، خواروو،
ناوەڕاست

**pancake** (pan′kāk′, paŋ′kāk′), *n.* (١) شلکێنە؛ جۆرە کێکێکە لە
شلکێنە ئەستوورترە بەیانیان دەخورێ. (٢) نیشتنەوەی فڕۆکە بە شێوەیەکی
ستوونی

*v.i. & v.t.* فڕۆکە نیشتنەوە بە شێوەیەکی ستوونی.

**panchromatic** (pan′krō-mat′ik), *adj.* بەرگەی هیچ جۆرە
ڕووناکییەک ناگرێ: *( ~ film)*.

**pancreas** (pan′kri-əs, paŋ′kri-əs), *n.* پەنکریاس؛ لوویەکە
شلەیەک دەردەدات و دەیڕژێنێتە گەدەوە بۆ پەلخورد کردن و هەڵمژینی خواردن.

**pancreatic** (pan′kri-at′ik, paŋ′kri-at′ik), *adj.* پەنکریاسی

**pancreatic juice,** شلەی پەنکریاسی (ووشەی پێشووتر ببینە).

**panda** (pan′də), *n.* (١) پاندا؛ وورچی چینی؛ گیاندارێکی شیردەری
ڕەش و سپیی تووکنی شاخەکانی چین و تیبێتە لە توخمی وورچە.
(هەروەها پێیشی دەووترێ " giant panda ").
(٢) گیاندارێکی بچووکی مەمکداری سووری کلک درێژە لە هیمالایا دەژی

**pandemic** (pan-dem′ik), *adj.* (١) بڵاو؛ گشتی.
(٢) بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە (نەخۆشی)؛ داکەوتوو.

*n.* درم؛ پەتا

**Pandemonium** (pan′di-mō′ni-əm), *n.* (١) شەیتانخانە؛
نشینگای شەیتانان (٢) دۆزەخ.
(٣) [p-]، ئاژاوەخانە؛ شوێنێکی پڕ لە پشێوی و بگرەوبەردە.
(٤) [p-]، ئاژاوە؛ پشێوی؛ بگرەوبەردە؛ گەرەلاوژێ.

**pander** (pan′dēr), *n. Also* **panderer,** (١) گەواد. (٢) دەلاڵ

*v.t.* [Archaic], گەوادی بۆ کردن.

*v.i.* ( ~ **to** ), گەوادی کردن؛ چی بووێت بۆی دەکات (شتی سووک).

**pandit** (pun′dit), *n.* کەسێکی زانا؛ دانا

**Pandora** (pan-dôr′ə, pan-dō′rə), *n.* پاندۆرا: ئافرەتێک بوو کە
" زووس " سەرۆکی خواکانی یۆنان ناردی بۆ سزادانی ئادەمیزاد بە-
سندووقێکەوە " Pandora's box " چونکە " پرۆمیسیەس " ئاگری دزی بوو
لە خوداکان وە کە سندووقەکەی کردەوە هەرچی بەڵاو خراپەو ناپەسەندی هەبوو
لێی هاتە دەرەوەو بڵاوبووەوە بەناو مرۆڤدا تەنها " هیوا " نەبێت لە سندووقەکەدا
مایەوە (ئەفسانەی یۆنانی)

**pandora** (pan-dôr′ə, pan-dō′rə), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی ژێدارە.

**pandurate** (pan′doo-rāt′, pan′dyoo-rit), *adj.* = **panduri-form.**

**panduriform** (pan-door′ə-fôrm′, pan-dyoor′ə-fôrm′), *adj.* لە کەمانچە دەچێ (وەک هەندێ گەڵا).

**pane** (pān), *n.* (١) تەختە شووشەی پەنجەرە؛ تەبەقە شووشەی پەنجەرە.
(٢) خانەی دەرگا؛ تەختەدار (کە بەشێک دەبێ لە دەرگا یا دیوار یا لەبەینی دوو
سنگدا لە شوورەیەکدا).

**panegyric** (pan′ə-jir′ik), *n.* (١) ووتارێکی ستایشی.
(٢) ستایش؛ پیاهەڵدان؛ ڕێزلێنان.

**panegyrize** (pan′ə-ji-rīz′), *v.t. & v.i.* ستایش کردن؛
پیاهەڵدان؛ ڕێزلێنان

**panel** (pan′'l), *n.* (١) (ا) لباد یا جلی ژێر زین (ب) زینی نەرم.
(٢) خانەی ڕوویەک کە نزمترە یا بەرزترە لە دەوروپشتەکەی یا خراوەتە ناو
چوارچێوەوە: (ا) خانەی بەینی دوو سنگی شوورەیەک.
(ب) خانەی دەرگایەک، دیوارێک یا سەر دۆڵابێک (ج) تەبەقە شووشەی پەنجەرە
(٢) دوگمەبەند؛ کلیل بەند (وەک ئوتومبیل و فڕۆکە): *( an instrument ~ )*
(٣) (ا) تەختەداری نیگار لەسەر کێشراو.
(ب) نیگار یا تابلۆیەکی وەها. (ج) وێنەیەکی لاکێشەیی.
(٤) کۆڕ؛ ئەنجوومەن: *( a ~ will discuss the issue.)*.
(٥) تەبەقی باڵێکی فڕۆکە. (٦) تیلماسکە قوماشێکی ڕەنگ جیاواز دەدرێ لە
کراسێک لە باری درێژی. (٧) (ا) لیستەی ناوی ئەو کەسانەی لە دادگاوە بانگ
دەکرێن بۆ بوون بە سوێندخۆر. (ب) کۆڕی سوێندخۆران (دادگا).

*v.t.* (١) تەبەقە شووشە، تەختە یا کانزا تێخستن؛
ڕازاندنەوە بە تەبەقەیەکی وەها (٢) کۆڕی سوێندخۆران هەڵبژاردن.

**panel discussion,** کۆڕ؛ کۆڕگرتنێکی ئاشکرا لەبەردەم کۆمەڵێک
خەڵکدا؛ لێکۆڵینەوەیەک لەلایەن دەستەیەکەوە لەبەردەم کۆمەڵێک خەڵکدا.

**paneling, panelling** (pan′'l-iŋ), *n.* (١) تەبەقە شووشە،
تەختە یا کانزا لێدان. (٢) تەبەقە تەختەی دیوار پێ داپۆشراو (بۆ جوانی یا
قایمی).

**panelist** (pan′'l-ist), *n.* (١) ئەندامی کۆڕ؛ بەشداری کۆڕ؛
ئەندامی دەستەی لێکۆڵینەوە. (٢) ئەندامی دەستەیەک کە لە بەرنامەیەکی ڕادیۆ
یا تەلەفزیۆندا پرسیاریان لێ دەکرێ.

**pan fish,** ماسییەک کە ئەوەندە بچکۆلە بێت بە ساغی لە تاوەیەکدا

سوور بکرێنەوە.

**pan-fry** (pan'frī'), *v.t.* سوورکردنەوە لە تاوەدا.

**pang** (paŋ), *n.* ئازاری توند و تیژی کوتوپڕ (هی لەش یا مێشک و هەست)؛ ئازارێکی تیژی وەک تیر؛ هەستێکی ناخۆشی کوتوپڕی:
*( the ~s of hunger; ~s of remorse)*

**panhandle** (pan'han'd'l), *n.* (١) دەسکی تاوە.
(٢) [P-]. ناوچەیەکە کە لە دەسکی تاوە بچێت ،وەک کلکی باکووری ڕۆژاوای تەکساس.

**panhandle** (pan'han'd'l), *v.t. & v.i.* [Slang]. سوالکردن؛ دەست لە خەلک پانکردنەوە.

**panhandler** (pan'han'dlēr), *n.* سوالکەر؛ دەست لە خەلک پانکەرەوە.

**Panhellenic** (pan'hə-len'ik), *adj.* (١) هی هەموو یۆنانییەکان (٢) هی یەکێتی هەموو یۆنانییەکان (٣) تایبەتی بە ڕێکخراوە کۆمەلایەتی- یەکانی کوران و کچانی زانکۆ کە ناوی یۆنانیان لێنراوە.

**Panhellenism** (pan-hel'ə-niz'm), *n.* بزووتنەوەی یەکگرتنی هەموو یۆنانییەکان؛ بیروباوەڕو ڕێبازی یەکگرتنی هەموو یۆنانییەکان.

**panic** (pan'ik), *adj.* هی وورەبەردان؛ هی تۆقان؛ لە ئەندازە بەدەر (ترس)؛ هی کاتی ناکاوی و ترسی زۆر: *( ~ fear)*
*n.* (١) وورەبەردان؛ ترسێکی لەنجگار زۆرو کوتوپڕ
*( The earthquake caused a lot of ~ .)*
(٢) ترسی هەرەس هێنانی دەزگا دارایییەکانی کۆمەل
(٣) [Slang]. کەسێک یا شتێکی قۆشمە.
*v.t.* (١) تۆقاندن؛ زۆر ترساندن؛ وورە پێ بەردان.
(٢) [Slang]. هێنانە پێکەنین.
*v.i.* تۆقین؛ زۆر ترسان؛ وورەبەردان؛ ترس لێ هەلنیشتن.
*( He ~ked when he lost control of the car.)*

**panic grass,** گیای ئالف؛ گیای گزرە.

**panicky** (pan'ik-i), *adj.* (١) وورەبەرداو؛ تۆقیو؛ زۆر ترساو.
(٢) پڕ لە ترس؛ ترس خەرەبەر: *( a ~ situation)*
(٣) زوو وورە بەردەر؛ بێ وورە؛ ترسنۆک؛ زوو دەتۆقێ.

**panicle** (pan'i-k'l), *n.* گولی پەڕ پەل، وەک گولە جۆداس)

**panic-stricken** (pan'ik-strik'n), *adj.* زۆر ترساو، تۆقیو، وورەبەرداو

**panic-struck** (pan'ik-struk'), *adj.* = panic-stricken.

**paniculate** (pə-nik'yoo-lāt', pə-nik'yoo-lit), *adj.* *Also-* **paniculated,** پەل پەلاوی (وەک گولە جۆداس)

**panjandrum** (pan-jan'drəm), *n.* کاربەدەستێکی خۆ بە زل زان؛ پیاوی گەورە (بەرووی لاقرتێوە):

**pannier** (pan'yēr, pan'i-ēr), *n.* (١) سەبەتە؛ بەرچنە؛ سەوی.
(٢) (ا) چوارچێوەیەکە تەنوورەی پێ فش دەکرێتەوە لەدەوری سمتدا. (ب) تەنوورەیەکی وەها فشکراوە.

**pannikin** (pan'ə-kin), *n.* (١) تاوەی بچکۆلە؛ مەنجەلۆکە
(٢) کووپی کانزایی

**panoply** (pan'ə-pli), *n.* (١) زرێی هەموو لەش داپۆشەر؛ قەلغان
(٢) (ا) بەرگی رەسمی. (ب) بەرگی ڕازاوەو جوان
(ج) بەرگی جوانی پارێزەر؛ قەلغان (مەجاز).
(٣) تەنتەنە؛ فەنتازێتی؛ خۆ نواندنێکی جوان:
*( the full ~ of a military funeral)*

**panorama** (pan'ə-ram'ə, pan'ə-rä'mə), *n.* (١) دیمەنێکی گەورەی جوان؛ دیمەنێکی گەورەی هەمووشت لێوە دیار
(٢) زنجیرە دیمەنێکە لەبابەت باسێکی تایبەتییەوە؛ زنجیرە دیمەنی ڕووداوێک:
*( a ~ of ancient civiliztion)*
(٣) چاوپیاخشاندنێکی گشتی؛ هەلسەنگاندنێکی گشتی

**panoramic** (pan'ə-ram'ik), *adj.* پان و گەورە (دیمەن)؛ هەمووشتێکی لێوە دیارە؛ هەموولایەکی لێوە دەبینرێ: *( a ~ view)*

**panpipe** (pan'pīp'), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی کۆنە بریتییە لە ڕیزە شمشالێکی لەیەکتر درێژتر.

**pansy** (pan'zi), *n.* (١) گولەوەنەوشە. (٢) بنەوشەیی؛ وەنەوشەیی.
(٣) [Slang]، (ا) سەرژنانی؛ کچانی؛ ژنانی؛ خلەکچانی. (ب) حیز؛ لووسکە.

**pant** (pant), *v.i.* (١) هەناسەبڕکێ کردن.
(٢) زۆر خێرا لێدان (دل)؛ پلدان؛ پرتەپرت کردن.
(٣) ( ~ for; ~ after )، بۆ بەتاسەوە بوون؛ بەپەرۆشەوە بوون؛ ئاوات بۆ خواستن؛ خۆزگە بۆ خواستن.
(٤) دووکەل یا هەلم لێ هەلسان (مەکینە)؛ فیشکەکردن.
*v.t.* ( ~ out; ~ forth ), بە هەناسەبڕکێوە ووتن.
*n.* (١) هەناسەبڕکێ. (٢) دل لێدان بە خێرایی و بەپەلە.
(٣) فیشکەی مەکینە؛ دووکەل یا هەلم لێ هەلسان.

**pantalets, pantaletts** (pan'tə-lets'), *n.pl.* (١) بەرگێکی ژێرەوەی ژنانەی وەک پانتۆلە لەژێر تەنوورەوە لەبەردەکرێ و لە ئەژنۆدا هەلدەکرێت و گێزوگولێنگی لێ دەدرێ (لە سەدەی نۆزدەدا لەبەر دەکرا)
(٢) گێزوگولێنگی دەوری ئەژنۆی ئەم پانتۆلە.

**pantaloon** (pan'tə-lōōn'), *n.* (١) [P-]، (ا) کەسێکە لە کەسانی شانۆنامەی قۆشمەی ئیتالی کۆن کە پانتۆلی تەسک و درێژی لەبەردەکرد و هەمیشە گالتەی پێ دەکرا (ب) کەسێکە لە کەسانی شانۆنامەی بێ دەنگ کە قۆشمەبازی شانۆنامەکە دەیکات بە گالتەچی خۆی. (٢) (*pl.*)، پانتۆل.

**pantheism** (pan'thē-iz'm), *n.* (١) بیروڕایەکە کە دەلێت: خوا لە هەمووشتێکدا هەیە و هەموو کەسێک و شتێک لەم جیهانەدا تایبەخۆی خوایی تێدایە؛ بیروڕایەکە دەلێت: خوا هەمووشتێکە و هەمووشتێکیش خوایە، واتە خواو سرووشت هەردووکیان هەر یەکێکن و هەمووشتێکیش وەک خوا پیرۆزە.
(٢) گشت خواپەرستی؛ ڕێرەوی جیهان پەرستی؛ ڕێرەوی هەمووشت پەرستی (گوایە خوا لە هەمووشتێکدا هەیە).

**pantheist** (pan'thē-ist), *n.* گشت خواپەرست (وشەی پێشوو ببینە).

-pantheistic *(adj.).*

**pantheon** (pan'thē-on', pan'thi-ən, pan-thē'ən), *n.* (١) [P-]، پەرستگایەکە لە ڕۆما بۆ گشت خواکان تەرخانکراوە.
(٢) پەرستگای گشت خواکان. (٣) هەموو خواکانی گەلێک.
(٤) گۆڕستانی پیاوە گەورەکانی گەلێک.

**panther** (pan'thēr), *n.* (١) پلنگ؛ پلنگی ئەمەریکی؛ دێز.
(٢) جۆرە پلنگێکی ڕەشە.

**pantheress** (pan'thēr-is), *n.* پلنگی مێیە؛ دێزی مێینە.

**panties** (pan'tiz), *n.pl.* دەرپێی کورتی ژن و مندال.

**pantile** (pan'tīl'), *n.* خشتی کاشییەکی سەربانە قەراغەکەی دەخرێتە سەر یەکتری کە لەسەر سەربان دادەنرێ.

**pantofle, pantoffle** (pan'tə-f'l, pan-tof''l, pan-tōō'f'l), *n.* پێلاوی ناومال؛ نەعل؛ سۆل.

**pantograph** (pan'tə-graf', pan'tə-gräf'), *n.* ئامێری وێنەی دەقاودەقی نەخشەو وێنە لەبەردەرکردن بە گەورەکراوی یا بچووکراوی

**pantomime** (pan'tə-mīm'), *n.* (١) نووانەری شانۆنامەیەکی بێ دەنگ لە ڕۆمای کۆندا. (٢) شانۆنامەی بێ دەنگ؛ نواندنێکی بێ گفتوگۆ (هەروەها " mime "). (٣) هێماو کردەوەی بێ دەنگی هەست و بیروباوەڕ دەربڕ.
*adj.* تایبەتی بە شانۆنامەی بێ دەنگ.
*v.t. & v.i.* نواندن لە شانۆنامەی بێ دەنگدا؛ بە هێماو کردەوە هەست و بیروباوەڕ دەربڕین.

-pantomimic *(adj.).*

**pantomimist** (pan'tə-mīm'ist), *n.* نووانەری شانۆنامەی- بێ دەنگ.

**pantry** (pan'tri), *n.* گەنجینە؛ ئازووقەخانە.

**pants** (pants), *n.pl.* (١) پانتول؛ شەروال. (٢) دەرپێی پیاوانە یا ژنانە.

**pap** (pap), *n.* (١) [Archaic]. گۆی مەمك.
(٢) شتێکی لە گۆی مەمك چوو.

**pap** (pap), *n.* (١) خواردنی شل یا نەرم بۆ منداڵی ساواو نەخۆش.
(٢) شتێکی هیچوپووچ و بێ بایەخ؛ کتێب و شتی نووسراوی هیچوپووچی بۆ خەڵکی بێ مێشك باش؛ شتی فشەڵ. (٣) چاکەی کاربەدەست بۆ ئاشناکانی.

**papa** (pä'pə, pə-pä'), *n. Also* pa; paw; pop. بابە؛ باوك؛ بوە (ووشەی مند ڵە).

**papacy** (pā'pə-si), *n.* (١) پاپایەتی؛ پلەوپایەی پاپا
(٢) ماوەی فەرمانڕەوایی پاپا. (٣) پاپاکان.
(٤) [P-]. فەرمانڕەوایی کڵێسەی کاسۆلیکی کە پاپا سەرۆکیەتی.

**papal** (pā'p'l), *adj.* (١) هی پاپ؛ پاپایی: *(a ~ visit)*.
(٢) هی پاپایەتی. (٣) تایبەتی بە کڵێسەی کاسۆلیکی.

**papaw** (pô'pô, pə-pô'), *n.* (١) papaya.
(٢) (أ) درەختێکی ئەمەریکای باکوورە بەرێکی زەردی پڕ لە دەنك دەگرێ.
(ب) بەری ئەم درەختە.

**papaya** (pə-pä'yə), *n.* (١) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرێکی وەك کاڵەك یا شەمامە دەگرێ. (٢) بەری ئەم درەختە

**paper** (pā'pēr), *n.* (١) کاغەز. (٢) پەڕە.
(٣) کاغەزی تێت لەسەر نووسراو یا چاپکراو؛ ووتاری نووسراو؛ لێکۆڵینەوە؛ ڕاپۆرت *(to write a ~)*.
(٤) کۆمپیالە؛ بانقەنۆت؛ بڕوانامەی دارایی. (٥) ڕۆژنامە.
(٦) کاغەزی تێوەپێچان؛ قوتووی کاغەز.
(٧) کاغەزی دیوار (کاغەزێکی جوانە سەرتاپا لە دیوار دەدرێت).
(٨) (أ) بلیتی خۆڕایی (سینەما و شانۆ).
(ب) ئەو کەسەی بەم بلیتە دەچێتە ژوورەوە.
(٩) بڕوانامە؛ ناسنامە.
(١٠) سەرجەمی نووسین و نامەو بڕوانامەی کەسێك: *(the Lincoln ~s)*.

*adj.* (١) هی کاغەز؛ کاغەز؛ لە کاغەز دروستکراو: *(~ money)*.
(٢) تەنك وەك کاغەز. (٣) تەنها لەسەر کاغەزە؛ بەناو: *(~ profits)*.

*v.t.* (١) بە کاغەز داپۆشین (دیوار) (ژمارە حەوت ببینە): *(to ~ a room)*.
(٢) لەسەر کاغەز نووسین؛ لەسەر نووسین؛ بە نووسین لێدووان.
(٣) بە کاغەز پێچانەوە.
(٤) [Slang]. پڕکردنی سینەما لە خەڵك بە بلیتی خۆڕایی.

**commit to paper,** نووسین؛ خستنە سەر کاغەز.

**on paper,** (١) بە نووسراوی؛ بە چاپکراوی؛ بە نووسین.
(٢) هەر بەناو؛ لەسەر کاغەز:
*(On paper he was worth nearly a million dollars.)*

**put pen to paper,** نووسین؛ دەست بە نووسین کردن.

**paperback** (pā'pēr-bak'), *n.* کتێبی بەرگ نەرم؛ کتێبی بەرگ کاغەز.

*adj.* هی بەرگی نەرم؛ هی بەرگ کاغەز *(a ~ edition of the novel)*.

**paper birch,** دارەسپی ئەمەریکی (کە توێکڵەکەی سپیکارە).

**paper-board** (pā'pēr-bôrd'), *n.* مقەبا

**paper-bound** (pā'pēr-bound'), *adj.* = paperback.

**paper cutter,** (١) paper knife.
(٢) کاغەزبڕ بە پانی و درێژییەك کە کەسێك بیەوێ.

**paper hanger,** کەسێکە کە پیشەی کاغەز گرتنە دیوارە.

**paper hangings,** = wallpaper.

**paper knife,** چەقۆیەکی هەردوو دیو کوڵە نامەو کتێبی تازەی پێ هەڵدەپچڕێت (پێشی دەووترێ: "paper cutter").

**paper mill,** کارگەی کاغەز.

**paper money,** پارەی کاغەز: *(A dollar bill is ~.)*.

**paper mulberry,** دارتووی کاغەز لێ دروستکراو

**paper nautilus,** گیاندارێکی هەشت پەلی ئاوییە لە توخمی هەشت پێ مێیەکانی قاوغێکی تەنکی وەك کاغەزی هەیە بەچکەکانی تێدا گەورە دەکات.

**paperweight** (pā'pēr-wāt'), *n.* شتێکی قورس و بچووکە دەخرێتە سەر کاغەزی سەرمێز بۆ ئەوەی پەرش و بڵاو نەبێتەوە.

**paperwork** (pā'pēr-wûrk'), *n. Also* **paper work,** فایلکاری؛ نووسینکاری (فەرمانگەی میری)؛ کاروباری ڕاپۆرت نووسین و خوێندنەوەو ئیستیمارە پڕکردنەوەو نامەو داواکاری و ئیشی مامۆستا... هتد.

**papeteric** (pap'ə-tri), *n.* سنووقی کەرەسەی نووسین.

**papier-mâché** (pā'pēr-mə-shā'), *n.* ماددەیەکە لە تلپەی کاغەزو جەوی پێکدێت بە نەرمی هەرچ شێوەیەك کە بوویستری ئەی دروست دەکرێ.

**papilionaceous** (pə-pil'i-ə-nā'shəs), *adj.* لە پەپوولە دەچێ (وەك هەندێ گوڵ)

**papilla** (pə-pil'ə), *n.* (١) (أ) گۆی مەمك؛ گۆ. (ب) شتێك کە لە گۆی بچووك بچێ (وەك زیادە گۆشتی بن ددانی تازە دەرهاتوو یا بن قژ یا سەر زمان)
(٢) شانەیەکی بچووکی دەربۆقیو (ڕووەکناسی).

**papillary** (pap'ə-ler'i, pə-pil'ēr-i), *adj.* گۆمەمکی؛ گۆیی.

**papilloma** (pap'ə-lō'mə), *n.* دوومەڵی گۆیی؛ زیادە گۆشتی گۆیی؛ مێخەکە.

**papillon** (pap'ə-lon'), *n.* سەگێکی بچووکی ئاومالە.

**papist** (pā'pist), *n.* کاسۆلیکی؛ پاپایی.

*adj.* کاسۆلیکی (لەڕووی ناحەزییەوە).

**papistry** (pā'pis-tri), *n.* بیروباوەڕی کاسۆلیکی (لەڕووی ناحەزییەوە).

**papoose** (pa-pōōs'), *n.* منداڵی ساوای هیندی سووری ئەمەریکایی.

**pappus** (pap'əs), *n.* تۆپەڵە تووکی دەوری هەندێ گوڵ، تۆوو میوە

**pappy** (pap'i), *adj.* نەرم؛ بڵ؛ شل.

**paprika, paprica** (pa-prē'kə, pap'ri-kə), *n.* ئاڵەتی سوور.

**Pap smear,** = Pap test.

**Pap test,** تاقیکردنەوەی شلەی دەردراوی زێی ئافرەت بۆ بوون و نەبوونی نەخۆشی شێرپەنجە. (هەروەها پێشی دەووترێ: "Pap smear").

**papyrus** (pə-pī'rəs), *n.* (١) زەل؛ ڕووەکێکە لە زەل دەچێ لە وڵاتی میسردا هەیە. (٢) کاغەزی زەل (٣) بڕوانامەیەك یا نووسراوێکی کۆنی لەسەر ئەم جۆرە کاغەزە نووسراو (وەك هی میسرییە کۆنەکان).

**par** (pär), *n.* (١) بەهای بەناوی پارە.
(٢) هاوتایی؛ یەکسانی؛ چوونیەکی لە پلە یا تواناڈا:
*(He is on a ~ with his classmates in ability.)*
(٣) ناوەندی؛ ئاستی ناوەندی؛ پلەی پەسەندکراو:
*(His work is above ~.; Her work is not up to ~.)*
(٤) بەهای بەناوی بەش (پارەبازی).

*adj.* (١) چوونیەك (پلە)؛ هاوتا. (٢) ناوەندی؛ مام ناوەندی.

**para-** (par'ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) بەتەنیشت؛ بەلای: *(parallel)*.
(٢) لەگەڵ. (٣) وەك؛ لێچوو. (٤) تێکچوو؛ نائاسایی (پزیشکەوانی).

**para-** (par'ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) پارێزەر: *(parachute)*.
(٢) پەڕەشووت بەکارهێنەر: *(paratroop)*.

**parable** (par'ə-b'l), *n.* سەرگوزەشتە؛ چیرۆکێکی کورتی پەند ڕوونکەرەوە.

**parabola** (pə-rab'ə-lə), *n.* هێڵێکی چەماوەیە لە بڕینی قورچەکێك بە ڕووتەختێکی هاوڕێك پەیدا دەبێ.

**parachute** (par'ə-shōōt'), *n.* پەڕەشووت؛ چەتری نیشتنەوە.

*v.t.* بە پەڕەشووت خستنە خوارەوە

*v.i.* بە پەڕەشووت هاتنە خوارەوە.

**parachutist** (par'ə-shōōt'ist), *n.* پەڕەشووتەوان؛ ئەوەی بە پەڕەشووت لە فڕۆکە دێتە خوارەوە (بەتایبەتی سەربان).

**paraclete** (par'ə-klēt'), *n.* (١) بە هاوارەوە هاتوو؛ لەسەرکەرەوە؛

لەسەرهەلدەر. (٢) [P-]، گیانی پیرۆز (خاچ پەرستی).

**parade** (pə-rād′), *n.* (١) خۆنواندن بە کەش‌وفش؛ خۆپیشاندانی بە تەنتەنە. (٢) (ا) خۆنواندنی لەشکر؛ خۆپیشاندانی سوپایی: *( a military ~ )*

(ب) جێی یەکگرتنی سوپا بۆ خۆنواندن.

(ج) جێی ئەم خۆ نواندنە.

(٣) ڕێ ڕۆیشتن: خۆپیشاندان یا نواندن بە ڕێ ڕۆیشتن؛ نمایش.

(٤) (ا) شەقامی گشتی پیاسەکردن؛ پیاسەڕێ. (ب) پیاسەکەران.

*v.t.* (١) لەشکر پیشاندان یا نواندن.

(٢) بە شەقامدا ڕۆیشتن لە خۆپیشانداندا: *( The band ~d the street.)* .

(٣) خۆپیشاندان بە کەش‌وفشەوە؛ خۆپیشاندان و خۆبادان: *( to ~ one's skill, knowledge, etc.)*

*v.i.* (١) بەشداربوون لە نوانرۆیی‌دا: بەسەر شەقامدا ڕۆیشتن و خۆپیشاندان.

(٢) بە کەش‌وفشەوە ڕۆیشتن: خۆبادان و خۆپیشاندان؛ پیاسەکردن.

(٣) ڕیزبوون بۆ خۆنواندن یا خۆپیشاندان (لەشکر).

**on parade,** لەبەرچاوی هەمووکەسە؛ دەرخراوە تا هەمووکەس بیبینێ.

**paradigm** (par′ə-dim, par′ə-dīm′), *n.* (١) نموونە؛ وێنە.

(٢) وێنەی هەموو شێوەکان و باری ووشە (ڕێزمان)

**paradigmatic** (par′ə-dig-mat′ik), *adj.* نموونەیی؛ وێنەیی.

**paradise** (par′ə-dīs′), *n.* (١) (ا) [P-]، بەهەشت (ئاین)

(ب) بەهەشت. (٢) (ا) شوێنێکی زۆر خۆش و جوانی وەك بەهەشت.

(ب) بارێکی زۆر خۆش و پڕ ئاسوودەی وەك بەهەشت.

**paradisiac** (par′ə-dis′i-ak′), *adj.* بەهەشتی؛ بەهەشتانە؛ خۆش و جوان وەك بەهەشت.

**paradox** (par′ə-doks′), *n.* (١) ووتەیەکە کە لەوە دەچێ بێ مانا بێ و بە مێشکدا نەچێ، بەلام لەوانەشە ڕاست بێ. (٢) ووتەیەکی ناکۆك و ناڕاست؛ ووتەیەکی نەگونجاو لەگەل خۆیدا.

(٣) (ا) شتێکی ناکۆك یا نەگونجاو بەپێی زانینی خەلك.

(ب) کەسێکە کە ڕەووشت و کردەوەی لەگەل یەکتر ناگونجێ

**paradoxical** (par′ə-dok′si-k′l), *adj.* لەگەل یەك نەگونجاو (ووتە، شت، ڕوودان)؛ ناکۆك: *( a ~ statement)* .

**-paradoxically** *(adv.).*

**paraffin, paraffine** (par′ə-fin, par′ə-fēn′), *n.* پارافین مادەیەکی سپی مێوی‌یە لە پەترۆل دەردەهێنرێ و دەکرێ بە مۆم و لە کاغەز دەدرێ تاکو ئاو کاری تێ نەکات

**paragenesis** (par′ə-jen′ə-sis), *n.* پێکهاتنی کانزا بەتەنیشت یەکەوە و بوون بە بەشێك لەیەکتر.

**paragon** (par′ə-gon′, par′ə-gən), *n.* (١) نموونە؛ وێنەی نایاب: *( She was a ~ of virtue and beauty.)* . (٢) ئەلماسێکی نایاب.

(٣) جۆرە قەوارەیەکی چاپە

**paragraph** (par′ə-graf′, par′ə-gräf′), *n.* (١) بەند (نووسین)

(٢) نیشانەی بەندی تازە. (٣) ووتارێکی کورتی ناو ڕۆژنامە یا گۆڤارێك.

*v.t.* (١) لە بەندێك یا چەند بەندێکدا نووسین.

(٢) بەند بەند کردن: بە بەند بەند ڕێکخستن.

*v.i.* وتاری کورت نووسین بۆ ڕۆژنامە.

**paragrapher** (par′ə-graf′ēr, par′ə-gräf′ēr), *n.* نووسەری ووتاری کورت (بەتایبەتی بۆ سەروتاری ڕۆژنامە).

**parakeet** (par′ə-kēt′), *n.* *Also* **parrakeet, parroket, paroquet, parroquet,** جۆرە تووتی‌یەکی بچووکە.

**paralax** (par′ə-laks′), *n.* وادیاربوونی گۆڕانی جێی شتێك بە سەیرکردنی لە گۆشەیەکی جیاوازەوە.

**parallel** (par′ə-lel′), *adj.* (١) هاوڕێك؛ بەرامبەر (هێل): *( ~ lines, bars, etc.)* . (٢) چوونیەك؛ وەك یەك؛ دەقاودەق وەك یەك.

*n.* (١) هێلی هاوڕێك؛ شتی هاوڕێك.

(٢) هاوتا؛ هاوکێش: *( kindness without ~ )* .

(٣) لەیەکچوون؛ چوونیەکی؛ هاوتایی. (٤) بەراوردکردن؛ بەراوردکاری.

(٥) هێلی پانی (جوگرافیا). (٦) *(pl.)*، دوو هێلی هاوڕێکی ستوونی‌یە بۆ تێبینی (پەراوێزی چاپەمەنی).

*v.t.* (١) هاوڕێك کردن. (٢) هاوڕێکبوون: *( The highway ~s the river.)* .

(٣) بەراوردکردن؛ پیشاندانی چوونیەکی. (٤) هاوتاکردن.

(٥) هاوتابوون؛ هاوکێش بوون؛ شان لە شان دان.

**parallel bars,** میلی هاوڕێك (وەرزش)؛ شیشی هاوڕێك.

**parallelepiped** (par′ə-lel′ə-pī′pid, par′ə-lel′ə-pip′id), *n.* ئاوێزەی شەش گۆشەیی (ئەندازە)؛ تەنێکی شەش ڕووی لاتەریبە.

**parallelism** (par′ə-lel-iz′m), *n.* (١) هاوڕێکی؛ بەرامبەری (هێل).

(٢) چوونیەکی؛ هاوتایی؛ هاوکێشی؛ وەك یەکی.

(٣) بیروباوەڕێکی فەلسەفی‌یە کە دەلێت: مێشك و لەش بە هاوتایی کاردەکەن و کاردەکەنە سەر یەکتری، بەلام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.

**parallel of latitude,** هێلی پانی (جوگرافیا).

**parallelogram** (par′ə-lel′ə-gram′), *n.* لاتەریب (ئەندازە).

**paralogism** (pə-ral′ə-jiz′m), *n.* هەلەی بیرکردنەوە و لێکدانەوە؛ هەلەکاری لێکدانەوە؛ ناژیربێژی.

**paralysis** (pə-ral′ə-sis), *n.* (١) ئیفلیجی؛ ئیفلیج بوون؛ گۆجی؛ ووشك بوون؛ سڕی؛ شەپلە؛ کەفتەکاری. (٢) پەککەوتن؛ لەکارکەوتن.

**paralytic** (par′ə-lit′ik), *adj.* (١) ئیفلیجکەر؛ وەك ئیفلیجی وایە؛ گۆجکەر. (٢) گۆج؛ ئیفلیج؛ کەفتەکار؛ پەککەوتە.

*n.* کەسێکی ئیفلیج؛ گۆج؛ پەککەوتە؛ شەپلە لێدراو.

**paralyze** (par′ə-līz′), *v.t.* (١) ئیفلیج کردن؛ گۆج کردن؛ کەفتەکارکردن؛ شەپلەلێدان.

(٢) لەکارخستن؛ پەکخستن؛ ووشك کردن؛ وەستاندن.

**paramatta** (par′ə-mat′ə), *n.* قوماشێکی تەنکی نەرمی خوری و لۆکە یا خوری و ئاوریشمە.

**paramedic** (par′ə-med′ik), *n.* برینپێچی فریاگوزاری (بەتایبەتی کەسێك کە فریای نەخۆش بکەوێ بە ئوتومبیلی فریاکەوتنی نەخۆشخانە و لەکاتی ناکاویدا)؛ یاریدەدەری پزیشك.

**paramedical** (par′ə-med′i-k′l), *adj.* هی برینپێچی فریاگوزاری و کارو پیشەیان؛ هی برینپێچ یا یاریدەدەری پزیشك.

**parament** (par′ə-mənt), *n.* شتوومەکی ڕازێنەرەوەی ئاینی (بۆ هەلواسین بە بەرگی قەشەی گەورەدا).

**parameter** (pə-ram′ə-tēr), *n.* (١) ژمارەی نرخی گۆڕاو (ژمارە و پێوان). (٢) سنوور؛ ڕادە. (٣) نیشانە؛ تایبەخۆ.

**paramilitary** (par′ə-mil′ə-ter′i), *adj.* تایبەتی بە هێزی نیمچە سوپایی (کە لەگەل سوپادا یا لەباتی سوپا کاردەکەن وە گەلێك جاریش بە نهێنی).

**paramorphism** (par′ə-môr′fiz′m), *n.* گۆڕانی کانزایەك بەبێ گۆڕانی پێکهاتنی کیمیایی کانزاکە.

**paramount** (par′ə-mount′), *adj.* (١) گرنگترین؛ بەرزترین؛ باشترین؛ زیاترین؛ هەرە بەرز: *( of ~ importance)* .

(٢) بەدەسەلاتترین؛ پلە بەرزترین؛ گەورەترین؛ مەزن: *( a ~ leader)*

*n.* بەدەسەلاتترین کەس؛ گەورەترین کەس؛ مەزنترین کەس؛ فەرمانڕەوای هەرە گەورە

**paramour** (par′ə-moor′), *n.* دۆست؛ یار؛ دلدار.

**paranoia** (par′ə-noi′ə), *n.* (١) نەخۆشی‌یەکی دەروونی‌یە بریتی‌یە لە هەست بە چەوساندنەوە کردن یا خۆ بە زل زانین.

(٢) زۆر بەگومان بوون لە خەلك؛ ترسێکی ئێجگار زۆر؛ زراوچوون.

**paranoiac** (par′ə-noi′ak), *n.* کەسێکی هەستکەر بە چەوسانەوە یا خۆ بە زل زان (نەخۆشی دەروونی)؛ کەسێکی زۆر بەگومان و بەترس لە خەلك.

*adj.* هەستکەر بە چەوساندنەوە؛ خۆ بە زل زان؛ زۆر بەگومان و بەترس.

**paranoid** (par′ə-noid′), *adj.* (١) هی نەخۆشی هەستکردن بە چەوسانەوە یا خۆ بە زل زانین. (٢) زۆر بەگومان و بەترس لە خەلك؛ زراوچوو.

*n.* (١) شتی هەستکەر بە چەوساندنەوە؛ شێتی خۆ بە زل زان.
(٢) کەسێکی زۆر بەگومان و بەترس لە خەڵك.

**paranymph** (par′ə-nimf), *n.* (١) برازاوا (٢) بەربووك.

**parapet** (par′ə-pit, par′ə-pet′), *n.* (١) دیوار یا شوورەی سەنگەر؛ سەنگەر (٢) شوورە یا دیواری باڵقون، سەربان، یا پرد؛ نەردە.

**paraph** (par′əf), *n.* نەقش و نیگارێکی بچووکی دوای ئیمزایە بۆ ڕێگرتن لە ساختە.

**paraphernalia** (par′ə-fër-nā′li-ə, par′ə-fə-nāl′yə), *n. pl.* (١) شتوومەکی خۆ؛ جۆروجیازی خۆ؛ ووردەشتی خۆ.
(٢) کەرەسە؛ ئامێر (٣) شتی جۆراوجۆر؛ ووردەشتی هەمەجۆر.
(٤) جۆروجیازی ناڤرەت خۆی؛ شتوومەکێکە کە ناڤرەت خۆی خاوەنی بێ.

**paraphrase** (par′ə-frāz′), *n.* (١) بە ووشەی خۆ دەربڕینی پارچە نووسراوێك یا ووتەی کەسێکی تر؛ ڕوونکردنەوە و کورتکردنەوەی نووسین و بیروڕای کەسێکی تر بە ووشەی خۆ
(٢) ڕاقیکردنەوەی دەربڕین و کورتکردنەوەی پارچە نووسراو و ووتەی کەسێکی تر بە ووشەی خۆ لە قوتابخانەدا.
*v.t. & v.i.* دەربڕین و ڕوونکردنەوە و کورتکردنەوەی پارچەیەك نووسراو یا ووتەی کەسێکی تر بە ووشەی خۆ.

**paraphrastic** (par′ə-fras′tik), *adj.* ڕوونکردنەوەیی؛ لێکدانەوەیی.

**paraplegia** (par′ə-plē′ji-ə), *n.* نیسکەنەرمە؛ گیری؛ ئیفلیجی بەشی خوارووی لەش.

**paraplegic** (par′ə-plej′ik, par′ə-plē′jik), *adj.* گیر؛ ئیفلیج؛ تووشی نیسکەنەرمە بووە؛ بەشی خوارەوەی لەشی ئیفلیجە.
*n.* کەسێك کە بەشی خوارووی لەشی ئیفلیج بێت؛ ئیفلیج؛ کەسێکی گیر یا تووشی نیسکەنەرمە بوو.

**parapsychology** (par′ə-sī-kol′ə-ji), *n.* پاراسایکۆلۆجی لقێکە لە زانستی دەروونناسی کە لە دیاردەی لە سرووشت بەدەر دەکۆڵێتەوە وەك دڵ خەبەردان بە ڕووداوێك یا دوورەسۆسە... هتد.

**paraquet** (par′ə-ket′), *n.* = parakeet.

**paraselene** (par′ə-si-lē′ni), *n.* ڕۆشنایییەکی مانگ ئاسایییە بەسەر خەرمانەی مانگەوە وە پێشی دەووترێ: " مانگە درۆزنە ".

**parasite** (par′ə-sīt′), *n.* (١) مشەخۆر؛ مفتەخۆر؛ هەوانتەخۆر؛ لاخۆر؛ لاوورگە؛ لاکوت؛ مووشەك. (٢) خۆرە؛ زیندەوەری مشەخۆر؛ ڕووەك یا گیانداری مشەخۆر

**parasitic** (par′ə-sit′ik), *adj.* (١) مشەخۆر؛ لاوورگە.
(٢) لە زیندەوەری مشەخۆرەوە تووش دەبێ (نەخۆشی).
**-parasitical** *(adj.)*; **parasitically** *(adv.)*.

**parasiticide** (par′ə-sit′ə-sīd′), *adj.* قەلاچۆکەری زیندەوەری مشەخۆر؛ بەناوبەری بوونەوەری لاوورگە
*n.* دەرمانی قەلاچۆکردن یا لەناوبردنی زیندەوەری مشەخۆر.

**parasitism** (par′ə-sīt-iz′m), *n.* (١) مشەخۆری؛ لاکوتی؛ لاوورگی.
(٢) نەخۆشی لە مشەخۆرەوە تووش بوو (وەك نەخۆشی پێست).

**parasitize** (par′ə-si-tīz′), *v.t.* مشەخۆری کردن؛ لاوورگی کردن

**parasitology** (par′ə-sī-tol′ə-ji), *n.* زانستی مشەخۆری.

**parasol** (par′ə-sôl′, par′ə-sol′), *n.* چەتری خۆرەتاوی ژنانە.

**parataxis** (par′ə-tak′sis), *n.* زنجیرەیەك ڕستەی لێکدراو بە بەرگول؛ لێکدانی چەند ڕستەیەك بە بەرگول (وەك ئەم سێ ڕستەیە):
*(I came., I saw., I conquered.)*

**parathyroid gland,** یەکێکە لەو چوار لووە هێلکەیییەی تەنیشت لووی " سایرۆید " لەژێر ملدا.

**paratrooper** (par′ə-trōōp′ēr), *n.* سەربازی پەرەشووت؛ پەرەشووتەوان

**paratroops** (par′ə-trōōps′), *n.pl.* هێزی سەربازی پەرەشووت؛ پەرەشووتەوانان

**paratyphoid fever,** جۆرێکە لە گرانەتا (کەمێك سووکترە).

**paravane** (par′ə-vān′), *n.* مەکینەی ڕامالینی مینەی دەریایی.

**par avion,** بە پۆستەی هەوایی؛ بە فڕۆکە.

**parboil** (pär′boil′), *v.t.* (١) نیوەکوڵ کردن (برنج، گۆشت).
(٢) زۆر گەرمابوون؛ گەرماکردن و بێ ئیسراحەت کردن.

**parbuckle** (pär′buk′l), *n.* گوریسی جووت قوڵفە (بۆ بەرزکردنەوەی بەرمیل و شتی تری لوولەکی).
*v.t.* هەڵبڕین بە گوریسی جووت قوڵفە (بەرمیل و شتی تری لوولەکی).

**parcel** (pär′s′l), *n.* (١) پڕیاسکە؛ بەستەك؛ گورزە؛ پاکەت.
(٢) دەستە؛ تاقم *(a ~ of fools)* . (٣) پەڵەزەوی (بەتایبەتی کە بەشێکی دابەشکراو بێ لە پارچەیەك زەوی گەورە): *(a ~ of land)* .
(٤) بەش؛ بەشێکی گرنگ و جیانەبووەوە: *(part and ~)* .
*v.t.* (١) ( ~ **out** )، بەش بەش کردن (زەوی):
*(to ~ out a piece of property or an estate)*
(٢) کردن بە پڕیاسکە؛ بەستەك کردن؛ پێچانەوە وەك پڕیاسکە.
(٣) گونیە پێچان لە گوریس یا پەتەوە (کەشتیوانی).
*adj. & adv.* نیمچەیی؛ بەشی؛ کەرتی؛ نەختێك؛ تا ڕادەیەك

**parcel post,** پۆستەی بەستەك و پڕیاسکە؛ پۆستەخانەی بەستەك و پڕیاسکە.

**parcenary** (pär′sə-ner′i), *n.* برابەشیی میراتی؛ هاوبەشیی میراتی.

**parcener** (pär′sə-nēr), *n.* برابەشی میراتی؛ هاوبەشی میراتی.

**parch** (pärch), *v.t.* (١) برژاندن (نۆك، گەنمەشامی... هتد).
(٢) ووشك کردنەوە؛ هەڵقرچاندن لە تینوێتیدا. (٣) تینووکردن.
(٤) هەڵقرچاندن بە سەرما
*v.i.* (١) زۆر ووشکبوونەوە؛ هەڵقرچان (لێو، زەوی). (٢) زۆر تینووبوون.

**parchment** (pärch′mənt), *n.* (١) پێستەی مەڕو بزن کە شتی لەسەر دەنووسرێ. (٢) بەڵگەنامەی لەسەر پێستەی وەها نووسراو
(٣) جۆرە کاغەزێکە لەم پێستەیە دەچێ.

**pard** (pärd), *n.* [Archaic or Poetic], ڕێز؛ پڵنگ.

**pard** (pärd), *n.* [Slang], هاوڕێ؛ دۆست؛ هاوبەش.

**pardon** (pär′d′n), *v.t.* (١) بەخشینی تاوانکار بە فەرمانی دادگا یا میری. (٢) لێ خۆش بوون؛ لێبووردن؛ بەخشین؛ گەردن ئازادکردن؛ چاو لێ پۆشین.
*n.* (١) (أ) بەخشینی تاوانکار بە فەرمانی دادگا یا میری؛ بەخشران.
(ب) فەرمانی ئەم بەخشینە. (٢) بەخشین لە گوناە (ئاینی کاسۆلیکی).
(٣) لێبووردن؛ لێ خۆش بوون؛ چاو لێ پۆشین

**I beg your pardon,** (١) بمبوورە؛ ببوورە
(٢) بەڵێ؟ گوێم لێ نەبوو چیت ووت تکایە دووبارەی کەرەوە.

**pardon me!?; pardon!?,** (١) ببوورە. (٢) بەڵێ؟.

**pardonable** (pär′d′n-ə-b′l), *adj.* دەبەخشرێ؛ دەبووررێ؛ چاوی لێ دەپۆشرێ.

**pardoner** (pär′d′n-ēr), *n.* (١) کەشیشێك بوو لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەلایەن پاپاوە دەسەڵاتی پێ درابوو کە بەڵگەنامەی لە گوناە خۆش بوون بە خەڵك بفرۆشێ. (٢) بەخشندە.

**pare** (pâr), *v.t.* (١) تاشین و ڕێك و پێك کردن؛ داتاشین.
(٢) پاککردن (میوە)؛ توێکڵ لێکردنەوە.
(٣) ( ~ **away**; ~ **down** )، بەرەبەرە کەمکردنەوە (خەرجی)؛ داتاشین

**paregoric** (par′ə-gôr′ik, par′ə-gor′ik), *adj.* ئازارکوژ.
*n.* دەرمانی ئازارکوژی بەنگاوی

**parent** (pâr′ənt), *n.* (١) باوك؛ دایك. (٢) باوو باپیر.
(٣) سەرچاوە؛ بنچینە؛ بناغە (٤) گیاندار یا ڕووەکی دایکە.

**parentage** (pâr′ənt-ij), *n.* (١) بنەچە؛ ڕەگەز (٢) باوك و دایکیتی.

**parental** (pə-ren′t′l), *adj.* دایك و باوکی؛ هی باوك و دایك

**parenteral** (par-en′tēr-əl), *adj.* لە دەرەوەی ڕیخۆڵە؛ لەڕێی دەم و گەدە و کیپالەوە نییە، بەڵکو لەڕێی بۆری خوێن یا ماسولکەوەیە

(وەك دەرمان یا خۆراكی نەخۆش).

**parenthesis** (pə-ren′thə-sis), ***n.*** (١) ووشە یا ووتەی نێوان دوو كەوانە یا پەرگول؛ رستە یا ووشەی ناوانخن. (٢) (*pl.*)، كەوانە (رێزمان)؛ دوو كەوانە (٣) رووداني بێ پەیوەندی بە باسەوە؛ بەسەرهاتی لەلاوە.

**parenthesize** (pə-ren′thə-sīz′), ***v.t.*** خستنە نێوان دوو كەوانە یا پەرگولەوە.

**parenthetical** (par′ən-thet′i-k'l), ***adj.*** (١) ناواخنی (رێزمان)؛ كەوانەیی (٢) تایبەتی بە رستەی ناواخنی: ( *a ~ statement* ).

-parenthetically *(adv.)*.

**parenthood** (pâr′ənt-hood′), ***n.*** باوكو دایكی؛ باوكو دایكێتی.

**paresis** (pə-rē′sis, par′ə-sis), ***n.*** (١) نیمچە ئیفلیجی؛ نیمچە گۆجی. (٢) general paresis.

**paresthesia, paraesthesia** (par′es-thē′zhə, par′es-thē′zhi-ə), ***n.*** تێكچوونی هەستی پێستو هەمیشە كزانەوەو خووران و مێروولەكردن.

-paresthetic *(adj.)*.

**paretic** (pə-ret′ik, pə-rē′tik), ***adj. & n.*** نیمچە ئیفلیج؛ نەخۆشی " paresis " ی هەیە.

**par excellence** (pär ek′sə-läns′), [Fr.], باشترین؛ نایابترین؛ بێ هاوتا؛ زۆرباش.

**parfait** (pär-fā′), ***n.*** جۆرە شیرینییەكە.

**parget** (pär′jit), ***v.t.*** گەچكاری كردن

***n.*** (١) گەچ (٢) گەچكاری؛ نەقشونیگاری گەچ بە دیوارەوە

**parhelic circle,** ئەلقەی خۆرناسا خەرمانەیەك یا ئەلقەیەكی رۆشنە لە ئاستی ئاسۆ (پێشی دەووترێ: " parhelic ring ").

**parhelion** (pär-hē′li-ən, pär-hēl′yən), ***n.*** خۆرە درۆزنە؛ رۆشناییەكە هەندێ جار لەسەر ئەلقەی خەرمانەی خۆر دەبینرێ.

**pariah** (pə-rī′ə, par′i-ə, pä′ri-ə), ***n.*** (١) ئەندامی چینێكی زۆر نزمی هیندستانو بۆرما. (٢) كەسێكی تەرەكراو یا دەركراو لە كۆمەڵ؛ كەسێكی خۆ لێوە دوورگیراو؛ كەسێكی دابراو لە كۆمەڵ.

**paries** (pâr′i-ēz′), ***n.*** دیواری ئەندامێك یا شانەیەكی بۆش.

**parietal** (pə-rī′ə-t'l), ***adj.*** (١) [Rare] تایبەتی بە ژیانی دانشگا. (٢) هی دیواری ئەندامی بۆش (٣) هی ئێسقانی سەروو لای كاسەی سەر (٤) بەستراوە بە دیواری مندالدانەوە (رووەكناسی)

**parietal lobe,** ئێسقانی سەروو لای دیواری كاسەی سەر.

**pari-mutuel** (par′i-mū′choo-əl), ***n.*** (١) هاوگرەوكاری؛ جۆرە گرەوێكی غارغارێنە كە براوەكان بەگوێرەی ئەمە پارە براوەكە بەش دەكەن بەپێی ئەو پارەیەی گرەویان لەسەر كردووە پاش مز سەندن. (٢) مەكینەی ئەم جۆرە گرەوە.

**paring** (pâr′iŋ), ***n.*** (١) تاشین؛ داتاشین؛ پاككردن؛ رنین (دارتاشی)؛ تونكڵ كردن (٢) تەڵاش؛ تونكڵ: ( *nail- ~s* ).

**pari passu** (par′i pas′ū, pâr′i pas′oo), [L.]. (١) وەكو یەك؛ شان بە شانی یەك؛ بە هەمان خێرایی: ( *to proceed ~* ). (٢) پێكەوەو لە هەمان كاتدا؛ لە هەمان كاتدا.

**Paris green,** تۆزێكی ژەهرینی سەوزە بۆ جانەوەر كوشتنو بۆیە بەكاردەهێنرێ

**parish** (par′ish), ***n.*** (١) قەشەنشینی ئینگلتەرە؛ ناوچەیەكی ئینگلیزی بە قەشە سپێردراوە بەپێی دابەشكردنی كڵێسەییەوە. (٢) ناوچەیەكی ئینگلتەرەی فەرمانڕەوایی ناوخۆیە (٣) (ا) قەشەنشین؛ گەرەك یا ناوچەی بە قەشە سپێردراو. (ب) ئەندامانی كڵێسەی ناوچەیەكی وەها

**go on the parish,** یارمەتی پارە وەرگرتن لە كڵێسەی ناوچە (بەتایبەتی لە ئینگلتەرە).

**parishioner** (pə-rish′ən-ēr), ***n.*** ئەندامی كڵێسە.

**Parisian** (pə-rizh′ən), ***adj. & n.*** پاریسی؛ نیشتەنی شاری پاریس.

**parity** (par′ə-ti), ***n.*** (١) یەكسانی؛ هاوتایی؛ هاوسەنگی؛ وەك یەكی. (٢) لەیەكچوون؛ چوونیەكی. (٣) هاونرخیی پارەی وڵاتان.

**parity** (par′ə-ti), ***n.*** (١) منداڵبوون؛ بوون بە دایك؛ منداڵ هێنانە دنیاوە. (٢) سەرجەمی منداڵانی ئافرەتێك.

**park** (pärk), ***n.*** (١) سەیرانگا؛ باخچەی گشتی؛ باخی میللی؛ مێرگوزار. (٢) یاریگای بێسبۆڵ. (هەروەها " ball park " یا " baseball park ") (٣) مۆڵگەی ئوتومبیل. (٤) مۆڵگەی ئوتومبیلو كەرەسەو تفاقی سوپا.

***v.t.*** (١) راگرتنی ئوتومبیل لە مۆڵگەدا؛ وەستانی ئوتومبیل لە شوێنێكدا. (٢) كۆكردنەوەی كەرەسەو تفاقی سوپاو ریزكردنیان لە مۆڵگەیەكدا (٣) [Slang]، دانان یا بەجێهێشتن لە شوێنێكدا بۆ ماوەیەك.

***v.i.*** ئوتومبیل راگرتن لە مۆڵگە یا شوێنێكی تردا.

**parking lot,** مۆڵگەی ئوتومبیل؛ گۆڕەپانی راگرتنی ئوتومبیل.

**parking meter,** مەكینەی كات راگرتنی ماوەی وەستانی ئوتومبیل (لەسەر شۆستە بە قەراغی شەقامەوە یا لە مۆڵگەدا دانراوەو پارەی تێ دەخرێ بۆ هەقی وەستانی ئوتومبیل).

**parking ticket,** تكتی ئوتومبیل وەستان: سزایەكی پارەیە پۆلیس دەیدات بە خاوەنی ئەو ئوتومبیلەی كە لە شوێنی قەدەغەدا دەیوەستێنێ یا لە كاتی خۆی زیاتر دەیوەستێنێ.

**Parkinson's disease,** نەخۆشی لەرزۆكی (بەتایبەتی دەستو سەر لەرزین)؛ نەخۆشی گۆجیو لەرزۆكی.

**parkway** (pärk′wā′), ***n.*** رێگەوبانێكی پانی قەراغ رازاوەیە بە داروەرەخت.

**parlance** (pär′ləns), ***n.*** (١) گفتوگۆ؛ ووتووێژ؛ راوێژ. (٢) شێوازی زمان (لە نووسین یا دوواندا): ( *newspaper ~* ).

**parlay** (pär′li, pär-lā′), ***v.t. & v.i.*** (١) گرەوكردن. (٢) بەكارهێنانی سەرمایەیەك بە لێهاتووانە.

**parley** (pär′li), ***v.i.*** گفتوگۆكردن (بەتایبەتی لەگەڵ دوژمندا)؛ كۆبرگرتن لەگەڵ دوژمندا.

***n.*** گفتوگۆی نێوان دوو سوپای دوژمن؛ راوێژكردن یا كۆبری نێوان دوو سوپای دوژمن بە یەك.

**parliament** (pär′lə-mənt), ***n.*** (١) پەرلەمان؛ ئەنجوومەنی نوێنەرانی گەل. (٢) [P-]، پەرلەمانی ئینگلیزی. (٣) یەكێك لە دادگا بەرزەكانی فەرەنسا لەپێش شۆڕشی ١٧٨٩ دا.

**parliamentarian** (pär′lə-men-târ′i-ən), ***n.*** (١) [P-]، لایەنگری پەرلەمان دژی (چارلسی یەكەم) لە شەڕی ناوخۆی ئینگلتەرەدا كە پێیان دەووترا: " سەرخر ". (٢) پەرلەمانتار: كەسێكی شارەزاو لێهاتوو لە پەیڕەوو چەندوچۆنی پەرلەمانیدا. (٣) ئەندامی پەرلەمان.

**parliamentary** (par′lə-men′tə-ri), ***adj.*** پەرلەمانی: (ا) وەك پەرلەمان؛ تایبەتی بە پەرلەمان. (ب) پەرلەمان فەرمانی لەسەر داوە. (ج) بە پەیڕەوی پەرلەمانە. (د) رژێمی پەرلەمانییە.

**parlor, parlour** (pär′lēr), ***n.*** (١) (ا) دیوەخان؛ ژووری میوان. (ب) ژووری دانیشتن. (٢) سالۆنی میوانخانە. (٣) دەزگای بازرگانی؛ دووكان: ( *an ice-cream ~ ; a beauty ~* ).

**parlor car,** فارگۆنی فەنتازی شەمەندەفەر.

**parlormaid** (pär′lēr-mād′), ***n.*** كارەكەری ژووری میوان.

**parlous** (pär′ləs), ***adj.*** (١) ترسناك؛ سامناك. (٢) زۆرزان؛ زیرەك.

***adv.*** [Archaic], ئێجگار زۆر؛ زۆر.

**Parmesan cheese,** پەنیرێكی ووشكە رەندە دەكرێتو دەكرێ بەسەر هەندێ خواردەمەنیدا.

**parochial** (pə-rō′ki-əl), ***adj.*** (١) هی گەرەكێك یا ناوچەیەكی كڵێسەیی؛ تایبەتی بە كڵێسە یا كڵێسەیەك؛ ئاینی: ( *a ~ school* ) (٢) تەسك (بیروڕا)؛ تەسكبین: ( *a ~ point of view, mentality, etc.* ).

**parochialism** (pə-rō′ki-əl-iz'm), ***n.*** تەسكی بیروڕا؛ تەسكبینی؛ بیركردنەوە لە گۆشەیەكی ناوچەییەوە نەك فراوانو گشتی.

**parochial school,** قوتابخانەی کلێسە؛ قوتابخانەیەکە کە کلێسە بەڕێوەی دەبات و پشتگیری دارایی دەکات.

**parodist** (par′ə-dist), ***n.*** نووسەری لاساییکەرەوە (وشەی داهاتوو ببینە)

**parody** (par′ə-di), ***n.*** (١) لاسایی وێژەیی و مۆسیقایی؛ نووسراوێك یا پارچە مۆسیقایەکە لاسایی نووسراوێك یا پارچە مۆسیقایەکی تر دەکاتەوە بۆ لاقرتێ. (٢) لاساییکردنەوەیەکی هیچ‌وپووچ و بێ مانا.

***v.t.*** لاسایی کردنەوەی نووسەرێك، هەڵبەستێك، یا پارچەیەك مۆسیقا... هتد: ***( to ~ an author, a poem, etc.)***

**parol** (par′əl), ***n.*** ووتار؛ ووتە

***adj.*** بەدەمی؛ ووتراو

**parole** (pə-rōl′), ***n.*** (١) پەیمان (بەتایبەتی دیلی جەنگ کە بەردرا نیتر وازدەهێنێ و شەڕ ناکاتەوە).
(٢) بەردانی بەندێك لە بەندیخانە پێش تەواوبوونی سزاکەی لەبەر ڕەفتار چاکی و پەیماندانی بە بەردەوام بوونی ئەم ڕەفتارە؛ بەردانی بەندێك بە مەرجی خراپە نەکردن: ***( to be on ~ ; to break one's ~ )*** .
(٣) ماوەی ئەم بەردانە. (٤) ووشەی نهێنی (سوپا).

***v.t.*** بەردان لە بەندیخانە پێش تەواوبوونی سزا لەبەر ڕەفتار چاکی و بە مەرجی خراپە نەکردن

**on parole,** ئازادکراوە لە بەندیخانە پێش تەواوبوونی سزاکەی لەبەر ڕەووشت باشی و بە مەرجی خراپە نەکردن.

**parolee** (pə-rō′lē′), ***n.*** بەندێکی ئازادکراو پێش تەواوبوونی سزاکەی لەبەر ڕەفتار چاکی و بە مەرجی خراپە نەکردن.

**paronomasia** (par′ə-nō-mā′zhə, par′ə-nō-mā′zhi-ə), ***n.*** (١) pun (٢) ووتەی بە تونکل بەکارهێنان.

**paronym** (par′ə-nim), ***n.*** (١) ووشەی هاودەنگ و هاوسەرچاوە.
(٢) ووشەی لە زمانی بێگانەوە وەرگیراو.

**paronymous** (pə-ron′ə-məs), ***adj.*** (١) هاوسەرچاوە (ووشە)
(٢) هاودەنگ، بەڵام مانا و حونجە و سەرچاوە جیاواز (ووشە):
**( e.g. pair, pare, pear )**

**paroquet** (par′ə-ket′), ***n.*** = **parakeet.**

**parotid** (pə-rot′id), ***adj.*** تایبەتی بە لووی بن گوێ.

***n.*** = **paratoid gland.**

**parotid gland,** لووی بن گوێ

**parotitis** (par′ə-tī′tis), ***n.*** ملەخرێ.

**-parous** (pēr′əs), پاشگرێکە بەمانای: منداڵبوون؛ بوون؛ هێنانە دنیاوە.

**paroxysm** (par′ək-siz′m), ***n.*** (١) لەپڕ سەر لێ هەڵدانەوەی نەخۆشی: ناوبەناو لێ پیس کردنی نەخۆشی. (٢) پێکەنین، تووڕەبوون، یا هەڵچوونێکی تاوتاو و خۆ بۆ نەگیران: فێ؛ حاڵ لێ هاتن.

**paroxytone** (par-ok′sə-tōn′), ***n.*** ووشەیەکە کە بڕگەی پێش دواهەمینی بگیرێ (ڕێزمان).

**parquet** (pär-kā′, pär-ket′), ***n.*** (١) زەمینەی نهۆمی یەکەمی شانۆیەکە لەبەردەمی شانۆکەوە هەتا ژێر باڵکۆنەکان.
(٢) (ا) تەختەداری نەقش‌ونیگاراوی جۆراوجۆری پارچە پارچە کە زەمینەیەکی پێ دادەپۆشرێ. (ب) زەمینەی داپۆشراو بەم جۆرە تەختەدارانە.

***v.t.*** داپۆشینی زەمینەی ژوور بە تەختەداری نەقش‌ونیگاراوی پارچە پارچە.

**parquet circle,** بەشی ژێر باڵکۆنی شانۆ.

**parquetry** (pär′kit-ri), ***n.*** تەختەداری نەقش‌ونیگاراوی جۆراوجۆری پارچە پارچە کە زەمینەی ژووری پێ دادەپۆشرێ.

**parrakeet** (par′ə-kēt′), ***n.*** = **parakeet.**

**parricide** (par′ə-sīd′), ***n.*** (١) باوك یا دایکی خۆکوژ؛ باوك و دایکی خۆکوژ. (٢) باوك یا دایکی خۆکوشتن؛ باوك و دایکی خۆکوشتن.

**-parricidal** ***(adj.).***

**parroket, parroquet** (par′ə-ket′), ***n.*** = **parakeet.**

**parrot** (par′ət), ***n.*** (١) تووتی
(٢) کەسێکە کە وەك تووتی لاسایی قسە و کردەوەی خەڵك دەکاتەوە.

***v.t.*** لاسایی کردنەوەی قسە و کردەوەی خەڵك وەك تووتی.

**parrot fever,** = **psittacosis.**

**parrot fish,** جۆرە ماسییەکە ڕەنگاوڕەنگییەکەی و کاژێری لە تووتی ئەچێ.

**parry** (par′i), ***v.t.*** (١) خۆ لێ پاراستن (مستەکۆڵە، لێدان)؛ لە خۆ لادان؛ خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ ڕزگارکردن.
(٢) وەڵام بەدەستەوە نەدان؛ خۆ بەدەستەوە نەدان.

***v.i.*** لە خۆ لادان؛ خۆ لێ پاراستن.

***n.*** (١) لە خۆ لادانی هێرش (شیربازی)؛ خۆپاراستن.
(٢) وەڵام بەدەستەوە نەدان: وەڵامی بە پێچ‌وپەنا.

**parse** (pärs), ***v.t.*** . شیکردنەوەی ڕستە (ڕێزمان): ***( to ~ a sentence)***

***v.i.*** شیکرانەوەی ڕستە.

**parsimonious** (pär′sə-mō′ni-əs), ***adj.*** ڕەزیل؛ پیسکە؛ پارەپیس.

**parsimony** (pär′sə-mō′ni), ***n.*** ڕەزیلی؛ پیسکەیی؛ پارەپیسی.

**parsley** (pärs′li), ***n.*** مەعدەنووس.

**parsnip** (pärs′nip), ***n.*** گێزەری سپی.

**parson** (pär′s′n), ***n.*** قەشە؛ کەشیش.

**parsonage** (pär′s′n-ij), ***n.*** (١)ماڵی قەشە (کە ئەندامانی کلێسەکەی پێی دەبەخشن). (٢) مووچە و زەوی‌وزاری بە قەشە بەخشراو (لەلایەن ئەندامانی کلێسەکەیەوە).

**part** (pärt), ***n.*** (١) (ا) بەش؛ کەرت. (ب) پارچە (مەکینە، ئامێر).
(ج) لەت؛ کەرت؛ پارچەی لێکراوە.
(د) هەند؛ بڕ: ***( He lost ~ of his fortune.)*** .
(ه) بەش: ***( Which ~ of the book did you like best?)*** .
(و) ئەندام (لەش)
(٢) بەرکەوت؛ بەش:
(ا) ئەرکی سەرشان؛ بەشی خۆ (کار): ***( We do our ~ .)*** .
(ب) (*pl.*)، توانا؛ لێهاتوویی: ***( a man of ~s)*** .
(ج) ڕۆڵی کەسێکی ناو شانۆنامە: ***( He played the ~ of a prince.)***
(د) ووتە و کرداری کەسێکی ناو شانۆنامەیەك.
(٣) (*pl.*)، ناوچە: ***( He left these ~s.)*** .
(٤) لا (سەوداگەری، پەیمان، ڕێکەوتن، ناکۆکی).
(٥) خەتی سەرداهێنان.

***v.t.*** (١) بەشکردن؛ بەش بەش کردن؛ پارچە پارچە کردن
(٢) سەرداهێنان بە دوو دیودا تا خەتی تێ بکەوێ: ***( He ~s his hair.)*** .
(٣) لەیەك جیاکردنەوە؛ جیاکردنەوە؛ لە یەك دابڕین.
(٤) لەیەك جیاکردنەوە لە مێشکدا. (٥) لەیەك جیاکردنەوەی دوو مادده (کیمیا).
(٦) [Archaic]، دابەشکردن؛ بەسەردا بەشکردن.

***v.i.*** (١) لەیەك جیابوونەوە. (٢) بوون بە چەند بەشێکەوە یا لقێکەوە.
(٣) پەیوەندی لەگەڵ بڕین؛ جیابوونەوە (برادەرێتی):
***( The friends ~ed in anger.)***
(٤) ڕۆیشتن؛ بەجێهێشتنی شوێنێك؛ جمان.
(٥) مردن؛ کۆچی دوایی کردن.

***adj.*** بەشێك: ***( to own ~ interest in a company)*** .

***adv.*** تاڕادەیەك؛ لە هەندێ ڕووەوە؛ لە لایەکەوە.

**for my part,** لەلایەن منەوە؛ بەلای منەوە.

**for the most part,** بەزۆری؛ بەشی زۆری.

**in part,** تاڕادەیەك؛ لە لایەکەوە؛ لە ڕوویەکەوە.

**part and parcel,** بەشێکی گرنگە لە؛ بەشێکی پێویست و جیانەبووەوەیە.

**part company,** (١) هەریەکە بە لایەکدا ڕۆیشتن.
(٢) لەیەك جیابوونەوە (برادەرێتی)؛ پەیوەندی پچڕاندن؛ لەیەك دابڕان.
(٣) ڕا لەگەڵ نەبوون؛ ڕا جیابوون لە:
***( On that question I'm afraid I must part company with***

*you.)*

**part from,** بەجێهێشتن (شوێن)؛ ڕۆیشتن.

**part with,** دەست لێ هەڵگرتن:

*( He doesn't like to part with his money.)*

**play a part,** (١) بە درۆ شتێك كردن بۆ خەڵەتاندن؛ بە ناپاكانەو هەر بە ڕواڵەت كردەوە كردن. (٢) بەشداربوون.

**take part in,** تێدا بەشداربوون؛ تێدا هاوبەش بوون.

**partake** (pär-tāk′), *v.i.* (١) تێدا بەشداربوون. (٢) هاوخوانی كردن؛ نانخواردن لەگەڵ؛ بەشی خۆ بردن.

*v.t.* [Rare], تێدا بەشداربوون؛ هاوبەش بوون.

**-partaker** *(n.).*

**partake of,** (١) (ا) هاوخوانی كردن؛ بەشداری كردن لە ژەمێك خواردندا:

*( to partake of a meal with one's friends)*

(ب) بردن؛ بەشی خۆ بردن؛ هەندێك بردن

(٢) هاوسرووشت بوون؛ لێچوون؛ لێكردن.

**parterre** (pär-târ′), *n.* (١) باخێكی گوڵی ڕارەودارو بە ئەندازە كراو؛ گوڵستانێكی نەخشەدار (٢) parquet circle .

**parthenocarpy** (pär′thə-nō-kar′pi), *n.* بەرگرتنی بێ چاكردن یا جووت گرتن.

**parthenogenesis** (pär′thə-nō-jen′ə-sis), *n.* زاینی بێ جووت بوون یا پەڕین؛ زاینی كچی؛ زاینی بێچوو لە هێلكەی بەپیت نەكراوەوە (وەك لە هەندێ جانەوەرو قەوزەدا).

**-parthenogenetic** *(adj.).*

**Parthenon** (pär′thə-non′, pär′thə-nən), *n.* پەرستگای بانوو‌خوا "ئەسینا" لە شاری "ئەسینا"ی پایتەختی یۆنان.

**Parthenos** (pär′thə-nos′), *n.* كچ؛ كچی كون نەكراو؛ تایبەخۆیەكی گەلێك لە بانووخواكانی كۆنی یۆنانە بەتایبەتی "ئەسینا".

**partial** (pär′shəl), *adj.* (١) لایەنگر؛ سەر بە لایەك؛ خاترگر؛ لاگر. (٢) ناتەواو؛ كەرتی؛ نەختی؛ نیمچە *( a ~ success, eclipse, etc.)* .

**partial to,** لایەنگرتن؛ خۆشویستن؛ بەدڵ بوون؛ لایەنگر بە.

**partial fraction,** كەرتی كەرت؛ كەرتی كەرتی.

**partiality** (pär′shi-al′ə-ti, pär-shal′ə-ti), *n.* (١) لایەنگری؛ بە لایەكدا داتاشین؛ خاتری لایەك گرتن.

(٢) حەزلێكردن؛ ویستن؛ بەدڵ بوون: *( a ~ for pretty girls)* .

**partially** (pär′shəl-i), *adv.* (١) بە لایەنگرانە؛ بە خاترگرتنی لایەك؛ بە داتاشین بە لایەكدا. (٢) تا ڕادەیەك؛ نەختێك؛ لە ڕوویەكەوە؛ لە لایەكەوە.

**partible** (pär′tə-b'l), *adj.* بەش دەكرێت؛ جیادەكرێتەوە

**participant** (pär-tis′ə-pənt, pēr-tis′ə-pənt), *n.* بەشداربوو؛ بەشدار؛ هاوبەش؛ بەشداری كارێك

*adj.* بەشداربوو؛ بەشدار؛ هاوبەشیكەر

**participate** (pär-tis′ə-pāt′, pēr-tis′ə-pāt′), *v.i.* بەشداربوون (لە كارێكدا)؛ هاوبەشی كردن *( to ~ in an activity, contest, etc.)* .

*v.t.* [Rare], بەشداری كردن؛ بەشداربوون.

**-participance** *(n.)*; **participator** *(n.).*

**participation** (pär-tis′ə-pā′shən, pēr-tis′ə-pā′shən), *n.* بەشداری (كار)؛ بەشداربوون؛ هاوبەش بوون

**participial** (pär′tə-sip′i-əl, pär′tə-sip′yəl), *adj.* تایبەتی بە " participle "

*n.* وشەیەكە لە كردارەوە وەرگیراوەو وەك ناو یا ئاوەڵناو لە ڕستەدا بەكاردەهێنرێ (ڕێزمان)

**participle** (pär′tə-si-p'l), *n.* ئاوەڵناوی كرداری؛ ووشەیەكە لە كردارەوە وەرگیراوەو وەك ئاوەڵناو بەكاردەهێنرێ وە تایبەخۆی كردارو ئاوەڵناویشی هەیە (ڕێزمان)

*( "Going" and "gone" are the present and past ~s of "go".)*

**particle** (pär′ti-k'l), *n.* (١) گەرد؛ تۆز؛ نەختال.

*( a dust ~ ; not a ~ of truth)*

(٢) بەند (نووسراو، ووتار).

(٣) ئامراز (وەك: ئامرازی پەیوەندیی‌و شوناسی... هتد) (ڕێزمان)

(٤) ووردیلە (فیزیا)؛ دەنكۆڵە. (٥) پارچە نانی پیرۆزكراو (كڵێسە).

**parti-colored** (pär′ti-kul′ērd), *adj.* (١) ڕەنگاوڕەنگ.

(٢) جۆراوجۆر؛ هەمەچەشنە.

**particular** (pēr-tik′yoo-lēr, pär-tik′yoo-lēr), *adj.* (١) هی تایبەتی؛ تایبەتی بە كەسێك، بارێك، یا شتێك:

*( a ~ person, case, situation, thing, etc.)*

(٢) تایبەتی: *( Why did she choose this ~ hat?)*

(٣) شایانی باس؛ گرنگ؛ تایبەتی: *( I had no ~ reason for going.)*

(٤) وورد؛ بەووردی: *( a full and ~ account of the incident)*

(٥) بە قێزوبێز؛ بە هیچ ڕازی نەبوو؛ تەڕپۆش؛ هەمووشتێكی لا گرنگە:

*( She's too ~ about what she wears.)*

*n.* (١) كەسێك، شتێك، یا بارێكی تایبەتی؛ شتێكی جیاواز.

(٢) تاكە شتێك؛ تێبینیی‌یەك؛ دانەیەكی ناسەرەكی؛ خاڵ.

**go into particulars,** بەووردی باسكردن؛ بە دووروودرێژی لێ دووان.

**in particular,** بەتایبەتی.

**particularism** (pēr-tik′yoo-lēr-iz'm), *n.* (١) بیروڕایەكی ئاینی‌یە كە دەڵێت: تەنها كەسانی تایبەتی دەچنە بەهەشت (ئایینناسی)

(٢) خۆ تەرخانكردن بۆ حیزبێك، بیروڕایەك، نەتەوەیەك، یا كارێكی تایبەتی.

(٣) سەربەخۆیی ناوخۆی نەتەوەو ناوچەی ووڵاتێك بەبێ گوێدان بە چاكەی ئەوانی تر؛ خودموختاری؛ ناوچەگەرێتی.

**particularity** (pēr-tik′yoo-lar′ə-ti, pär-tik′yoo-lar′ə-ti), *n.* (١) تایبەتی‌یەتی. (٢) زۆر بەتەنگ هەمووشتێكەوە هاتن ئەگەرچی ووردیش بێ؛ زۆر گوێدان بە شتی وورد.

(٣) بە قێزوبێزی؛ بە پەلەپیتكە خۆ تەكاندن؛ تەڕپۆشی.

(٤) شتێكی تایبەتی: (ا) تایبەخۆیەك.

(ب) شتێكی ووردو ناگرنگ؛ تاكە شتێكی ناگرنگ؛ خاڵ.

**particularize** (pēr-tik′yoo-lēr-īz′, pär-tik′yoo-lēr-īz′), *v.t.* تایبەتی كردن؛ یەك بە یەك ناوهێنان یا باسكردن؛ بەتایبەتی‌و دووروودرێژی باسكردن نەك بەگشتی.

**-particularization** *(n.).*

**particularly** (pēr-tik′yoo-lēr-li, pär-tik′yoo-lēr-li), *adv.* (١) بەتایبەتی. (٢) یەك بە یەك؛ بەووردی؛ بە دووروودرێژی.

**parting** (pär′tiŋ), *adj.* (١) جیاكەرەوە. (٢) ڕۆیشتوو.

(٣) مردوو؛ لەمردندایە.

(٤) لەكاتی ڕۆیشتندا ووتراو یا كراو: *( a ~ comment)*

*n.* (١) جیابوونەوە؛ لەیەك جیابوونەوە؛ بەش بوون.

(٢) شوێنی لەیەك جیابوونەوە؛ دووڕێیان.

(٣) جیاكەرەوە؛ شتی لەیەك جیاكەرەوە. (٤) خەتی سەرداهێنان

(٥) ڕۆیشتن؛ خواحافیزی. (٦) مردن؛ كۆچی دوایی.

**partisan, partizan** (pär′tə-z'n), *n.* (١) حیزبچی؛ لایەنگر؛ حیزبی؛ لایەنگری بەتین‌و كوێرانە. (٢) خەباتكەری چەكدار (بەتایبەتی لە ناوجەرگەی خاكی دوژمندا)؛ پێشمەرگە؛ پارتیزان.

*adj.* (١) تایبەتی بە حیزبێك؛ سەر بە حیزب یا كۆمەڵێك؛ لایەنگری كوێرانە:

*( ~ politics)*

(٢) پێشمەرگەیی؛ هی خەباتكەری چەكدار؛ پارتیزانی:

*( ~ fighting, warefare, operations, etc.)*

**partisanship** (pär′tə-z'n-ship′), *n.* (١) لایەنگری؛ حیزبچێتی؛ حیزبێتی. (٢) لایەنگری كوێرانە.

**partite** (pär′tīt), *adj.* بەش بەش؛ بەشكراو؛ بەش: *( tripartite)* .

**partition** (pär-tish′ən, pēr-tish′ən), *n.* (١) بەش بەش كردن؛ بەشكردن؛ جیاكردنەوە. (٢) تیغەدیوار؛ تیغە؛ دیوار؛ پەردە

(٣) بەش؛ پارچە؛ لەت؛ خانە.

(٤) دابەشکردنی خانووبەرە یا زەوی‌وزارو تاپۆکردنی هەر بەشەی لەسەر یەکێك.
(٥) دابەشکردن (ژمارەوپێوان).
*v.t.* (١) بەش بەش کردن؛ بەشکردن؛ دابەشکردن: *( to ~ a country)* .
(٢) بە تیغەدیوار یا پەردە جیاکردنەوە: *( to ~ a room)* .
**partitive** (pär′tə-tiv), *adj.* (١) جیاکەرەوە؛ لەیەك جیاکەرەوە.
(٢) تایبەتی بە ووشەی بەستەرەوە یا بەشی.
*n.* ووشەی بەشی (ڕێزمان): **( few, some, any, etc.)** .
**partizan** (pär′tə-z′n), *n. & adj.* = partisan.
**partlet** (pärt′lit), *n.* بەرگێکی ژنانەی نەقش‌ونیگاردارە شان‌و مل‌و بەرسنگ دادەپۆشێت.
**partly** (pärt′li), *adv.* تا ڕادەیەك؛ هەندێك؛ لە لایەکەوە؛ لە سەرێکەوە.
**partner** (pärt′nêr), *n.* (١) هاوبەش؛ بەشدار؛ برابەش؛ هاوکار.
(٢) هاوبەشی ژیان؛ هاوسەر؛ ژن؛ مێرد. (٣) هاوبەش (یاری، یاری کاغەز)؛ هاوتیپ. (٤) ناوەڵ سەما (لە سەمای دووکەسیدا).
(٥) کۆڵەکەی تەوەر (کەشتی بایەوان).
*v.t.* (١) کردن بە هاوبەش. (٢) بوون بە هاوبەش.
**partnership** (pärt′nēr-ship′), *n.* (١) هاوبەشی؛ بەشداری؛ هاوکاری؛ ناوکۆیی. (٢): (ا) کۆمپانیای هاوبەشی.
(ب) پەیمانی کۆمپانیای هاوبەشی. (ج) هاوبەشانی کۆمپانیایەکی وەها.
**part of speech,** (١) بەشێك لە بەشەکانی ئاخاوتن (ڕێزمان): (وەك: ناو، ناوەڵناو، کردار... هتد). (٢) ووشەیەکی یەکێك لەم بەشانەی ئاخاوتن.
**partook** (pär-took′), *past tense of* **partake.**
**partridge** (pär′trij), *n.* کەو.
**part-time** (pärt′tīm′), *adj.* کەرتەکات؛ نیمەکات؛ سەرومڕ نییە؛ بەڵکو تەنها بەشێکی ڕۆژ، هەفتە، یا مانگە (کار):
*( ~ work, teaching, etc.; a ~ teacher, student, etc.)*
**parturient** (pär-tyoor′i-ənt, pär-toor′i-ənt), *adj.* (١) دەزێ؛ خەریکە دەزێ؛ خەریکە منداڵی دەبێ؛ لە ژاندایە. (٢) هی زایین؛ هی منداڵبوون.
(٣) خەریکە شتێکی تازە بدۆزێتەوە یا بیرێکی تازەی بۆ بێت.
**parturition** (pär′choo-rish′ən), *n.* زایین؛ منداڵبوون؛ بەچکەبوون.
**party** (pär′ti), *n.* (١) حیزب.
(٢) دەستە؛ کۆمەڵ؛ تاقم: *( a surveying ~ )* .
(٣) ئاهەنگ؛ زەماوەند: *( a ~ ; a dinner ~ ; a cocktail ~ )* .
(٤) بەشدار؛ پەیوەندیدار: *( I'll not be ~ to the affair.)* .
(٥) لا (ناکۆکی، دادخوازی)؛ لایەن.
**party-colored** (pär′ti-kul′ẽrd), *adj.* = parti-colored.
**party line,** (١) سنووری نێوان دوو زەوی.
(٢) هێڵی ناوکۆیی تەلەفۆن؛ هێڵێکە کە تەلەفۆنی چەندماڵێکی لەسەرەو هەرجارە یەکێکیان دەتوانن تەلەفۆنەکانیان بەکاربهێنن. (٣) (*pl.*)، پەیڕەوو ڕێبازی حیزبێك کە نە حیزبەکەو نە ئەندامەکانی لێی لانادەن.
**party man,** ئەندامی دڵسۆزو پشت پێ بەستراوی حیزب؛ ئەندامی لە ڕێ لانەدەری حیزب.
**party politics,** حیزبایەتی؛ حیزبایەتی کوێرانە؛ حیزب پەرستی.
**party wall,** دیواری بەینی دوو خانوو؛ دیواری ناوکۆیی دوو خانوو.
**parure** (pə-roor′), *n.* دەستە خشڵ.
**parvenu** (pär′və-nōō′, pär′və-nū′), *n.* تازەپیاکەوتوو؛ نەدی‌وبدی؛ تازە دەوڵەمەند.
*adj.* هی تازەپیاکەوتوو، وەك نەدی‌وبدی.
**parvis** (pär′vis), *n.* (١) حەوشەی کڵێسە یا کۆشك.
(٢) ڕیزە کۆڵەکەی بەردەمی کڵێسە.
**pasha** (pə-shä′, pash′ə, pä′shə), *n.* پاشا.
**pass** (pas, päs), *n.* دەربەند.
**pass** (pas, päs), *v.i.* (١) ڕۆیشتن؛ بۆ پێشەوە چوون.
(٢) درێژبوونەوە؛ ڕۆیشتن (ڕێگە): *( The road ~es around the hill.)* .

(٣) دەستاودەست کردن
(٤) گۆڕان (لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر):
*( to ~ from a solid to a liquid state)*
(٥) تێپەڕبوون؛ پێ گەیشتنەوەو تێپەڕبوون:
*( The sports car ~ed on the right.)*
(٦) ووتران لەنێوان دوو کەس یا لادا؛ کران (سڵاو، قسە).
(٧) (ا) دوایی هاتن؛ وەستان؛ بەسەرچوون:
*( The fever ~ed.; The storm ~ed.)*
(ب) ڕۆیشتن؛ بەجێهێشتن.
(٨) ( **on** ~ ): مردن
(٩) تێپەڕبوون؛ بەسەرچوون. *( The hour ~ed quickly.)* .
(١٠) دانران (یاسا)؛ پەسەندکران (گەڵاڵەی یاسا): *( The bill ~ed.)* .
(١١) دەرچوون (تاقیکردنەوە)؛ بڕین: *( to ~ a test)* .
(١٢) ڕوودان: *( What ~ed in my absence?)* .
(١٣) بڕیاردران؛ بڕیاردان: *( The jury ~ed upon the case.)* .
(١٤) پەڕاندن (نۆبەی خۆ بەتایبەتی لە یاری کاغەزدا).
(١٥) تۆپ فڕێدان بۆ هاوتیپ.
(١٦) دران لە کەسێکەوە بە کەسێکی تر (ناتۆ، ناو، پلەوپایە):
*( The title ~ed to the elder son.)*
*v.t.* (١) بەجێهێشتن؛ بەلادا تێپەڕبوون‌و بەجێهێشتن؛ بەلادا ڕەت بوون:
*( I ~ed Mr. Johnson just now.; We have ~ed her house.)*
(٢) [Archaic]، بڕین (ڕێگە).
(٣) بەلادا ڕۆیشتن‌و نەبینین؛ گوێ پێ نەدان.
(٤) قازانج نەدان.
(٥) زیاتربوون لە؛ تێپەڕبوون: *( The returns ~ed all expectations.)* .
(٦) (ا) دەرچوون (تاقیکردنەوە)؛ بڕین؛ تێدا سەرکەوتن:
*( He ~ed every test.)*
(ب) دەرچوواندن: *( The teacher ~ed all the students.)* .
(٧) دەست پێداهێنان: *( He ~ed his hand through her hair.)*
(٨) پێداکردن؛ پێدابردن *( to ~ a thread through a needle)*
(٩) بە بەردەمدا ڕۆیشتن.
(١٠) بردنەسەر؛ کات بەسەربردن؛ ڕابواردن:
*( He ~ed his winter in the mountains.)*
(١١) (ا) گەیاندن؛ ڕاگەیاندن: *( They ~ed the news quickly.)*
(ب) دانەدەست؛ پێدان: *( P~ the bread, salt, knife, etc.)* .
(ج) شتی ساختە دەستاودەست پێکردن: *( to ~ counterfeit money)*
(د) لەسەر یەکێکی تر تاپۆکردن.
(١٢) تۆپ فڕێدان بۆ هاوتیپ: *( to ~ the ball)*
(١٣) لێ دەرچوون؛ لێ هاتنە دەرێ: *( No secrets ~ her lips.)* .
(١٤) میزو گوو کردن: *( to ~ water)* .
(١٥) (ا) دانان (یاسا)؛ پەسەندکردن: *( The parliament ~ed the bill.)*
(ب) دانران (یاسا)؛ پەسەندکران
*( The bill ~ed the House of Representatives.)*
(١٦) بڕیاردەرکردن: *( to ~ judgment on something of someone)*
*n.* (١) ڕۆیشتن؛ تێپەڕبوون؛ ڕەت بوون. (٢) دەرچوون (تاقیکردنەوە)؛ بڕین.
(٣) نمرەی دەرچوون؛ نمرەی بەناستەم دەرچوون:
*( She got a ~ in the exam.)*
(٤) بار (بەتایبەتی هی گیروگرفتاوی)؛ دۆخ: *( a strange ~ )* .
(٥) (ا) بلیتی خۆڕایی؛ بلیتی هەمیشەیی خۆڕایی.
(ب) پشوونامەی سەرباز. (ج) تێپەڕنامە.
(٦) دەست سووکی جادووگەرو قومارچی بۆ فێڵبازی‌و گزی.
(٧) جووڵەی دەست لە نواندنی موگناتیسیدا.
(٨) شاڵاوی فڕۆکە بەسەر نیشانێکدا؛ بەسەردا تێپەڕبوون.
(٩) نۆبەی خۆ پەڕاندن (یاری کاغەز).
(١٠) (ا) تۆپ فڕێدان بۆ هاوتیپ. (ب) شیر پێداکردن (شەڕە شیر).

(١١) هەوڵی چاوباشقاڵی لەگەڵ کردن دان؛ هەوڵی تاوکردن دان:
*( He made a ~ at her.)*

**a pretty pass,** بارێکی گیروگرفتاوی؛ بارێکی ناخۆش و مەترسیدار.
**bring to pass,** بوون بەهۆی ڕوودان.
**come to pass,** ڕوودان؛ هاتنەدی؛ وا ڕێکەوتن.
**make a pass at,** (١) هەوڵی لێدان دان؛ شاڵاو بۆ بردن بۆ لێدان
(٢) [Slang]. هەوڵی چاوباشقاڵی لەگەڵ کردن دان؛ هەوڵی تاوکردن دان.
**pass around,** دەستاودەست پێکردن؛ لە یەکێکەوە دران بە یەکێکی تر؛ بەسەردا گێڕان؛ دابەشین.
**pass away,** مردن؛ کۆچی دوایی کردن؛ دوایی هاتن.
**pass by,** (١) بەلادا تێپەڕین. (٢) پیشاندان بۆ ڕا وەرگرتن.
**pass for,** وا هاتنە بەرچاو (شتی ساختە)؛ وا دانران؛ بەدرۆ وا دەرکەوتن.
**pass off,** (١) بەسەرچوون؛ دوایی هاتن. (٢) ڕوودان؛ هاتنەدی.
(٣) بەدرۆ وا نیشاندان: *( He passed himself off as a nobleman.)* .
(٤) سەرنج لێ لابردن (بارێکی تەریقکەرەوە)؛ بە گاڵتەگرتن (بۆ تەریق نەبوونەوە).
**pass one's lips,** (١) خواردنەوە؛ خواردن.
(٢) درکاندن؛ لە دەم هاتنە دەرێ؛ وتن.
**pass out, [Slang],** بوردنەوە؛ بورانەوە.
**pass over,** پەڕاندن؛ بواردن؛ گوێ پێ نەدان.
**pass through,** پێدا تێپەڕبوون (ناخۆشی)؛ بەسەردا هاتن؛ چەشتن.
**pass time,** ڕۆژ بردنە سەر؛ کات بەسەربردن؛ کات کوشتن.
**pass up,** هەل لە دەست خۆ دان؛ هەل لەکیس چوون؛ لە دەست دان؛ لەقە لێدان (مەجال): *( to pass up an opportunity)*

**passable** (pas′ə-b'l, päs′ə-b'l), *adj.* (١) دەبڕرێت (ڕێگە)؛ دەتوانرێت پێیدا بڕۆیت یا بیپەڕیتەوە: *( a ~ road, stream, etc.)*
(٢) دەستاودەستی پێ دەکرێ (پارە)؛ بۆ ئاڵوێرپێکردن دەشێ:
*( ~ currency)*
(٣) مام ناوەندی؛ پەسەند؛ نە باش و نە خراپ.
*( ~ grades; a ~ knowledge of English)*
(٤) بوی هەیە بکرێ بە یاسا؛ لەوانەیە دەنگی لەسەر بدرێ بۆ بوون بە یاسا.
**passably** (pas′ə-bli, päs′ə-bli), *adv.* بە مام ناوەندییانە
**passacaglia** (pas′ə-käl′yə), *n.* (١) سەمایەکی ئیتاڵی کۆنە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**passado** (pə-sä′dō), *n.* شیر بیاکردن لە هەڵوێستێکی وەهادا کە قاچێکی شیربازەکە لەپێش ئەوی تریەوە بێت.
**passage** (pas′ij), *n.* (١) (ا) ڕۆیشتن؛ تێپەڕبوون؛ ڕەت بوون؛ چوون
(ب) بەسەرچوون؛ تێپەڕبوون (کات): *( the ~ of time)*
(ج) گۆڕان (لە بارێکەوە بۆ بارێک یا لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر).
(د) [Obs.]. مردن؛ کۆچی دوایی کردن
(هـ) دانانی یاسا؛ کردن بە یاسا؛ مۆرکردن؛ پەسەندکردن (پەرلەمان):
*( the ~ of a bill)*
(٢) گەشتی دەریایی یا هەوایی.
(٣) (ا) مافی گەشتکردن بە کەشتی؛ کورسی یا جێی گیراو لە کەشتیدا:
*( to book a ~ )*
(ب) کرێی گەشتێکی وەها.
(٤) (ا) ڕێگە؛ گوزەر؛ ڕێباز. (ب) ڕاڕەو (ج) بۆری؛ کون: *( the nasal ~ )* .
(٥) مافی هاتن و چوون بەسەربەستی.
(٦) ئەوەی کە ڕوودەدات لەنێوان دوو کەسدا (شەڕ، وتوووێژ، دڵداری... هتد).
(٧) پارچە یا برگە (وتار، چیرۆک، شانۆنامە)؛ بەند: *( a ~ from Hamlet)* .
(٨) بەشێکی سیمفۆنییەک یا بەرهەمێکی مۆسیقایی.
(٩) گووکردن؛ پیسایی کردن
*v.i.* (١) گەشتکردن؛ چوونە گەشت؛ ڕۆیشتن. (٢) شەڕکردن؛ دەمەقاڵێ بوون.
**passageway** (pas′ij-wā′), *n.* ڕێگە؛ ڕاڕەو؛ کۆڵان؛ گوزەر.
**passbook** (pas′book′, päs′book′), *n.* (١) دەفتەری حسابی بانقی کەسێ (پێشی دەووترێ: " bankbook "). (٢) دەفتەری حساباتی دوکاندار یا بازرگان.

**pass degree, [Chiefly British],** بڕوانامەی بەئاستەم دەرچوون لە زانکۆ.
**passé** (pa-sā′, pas′ā), *adj.* (١) کۆنەباو؛ باو نەماو؛ بەسەرچوو.
(٢) پیر؛ کۆن؛ سیس؛ پەککەوتوو.
**passel** (pas′'l), *n.* فرە؛ ژمارەیەکی زۆر؛ گەلێک.
**passementerie** (pas-men′tri), *n.* نەقشکاریی قەراغی جل و بەرگ.
**passenger** (pas′'n-jēr), *n.* (١) ڕێبوار؛ کاروانی؛ ڕەوەند.
(٢) گەشتکەر؛ سوار؛ ڕەفتەنی.
**passenger pigeon,** جۆرە کۆترێکی قڕتێکەوتووی کۆچەری کلک درێژی ئەمەریکایییە.
**passe partout** (pas pär-to͞o′), [Fr.], (١) ئەوەی بە هەموو شوێنێکدا دەچێ؛ ئەوەی هیچ ڕێگەیەکی لێ ناگیرێ. (٢) کلیلی گشتی؛ شاکلیل؛ کلیلێکە گەلێک قفڵی جیاواز دەکاتەوە. (٣) مقەبا یا کاغەزی وێنە لە چوارچێوە گرتن. (٤) شریتی سرێشاوی پەراوێزی وێنەی لە چوارچێوە گیراو.
**passer-by** (pas′ēr-bī′, päs′ēr-bī′), *n.* کەسێکی بەلادا تێپەڕبوو؛ مرۆڤی تێپەڕبوو.
**passerine** (pas′ēr-in′, pas′ēr-īn′), *adj.* تایبەتی بە باڵندەی نیشتووی دەنگ خۆش (وەك بۆرەك و فیسقەکولە و پاساری... هتد).
*n.* باڵندەیەکی ئەم تۆخمە.
**pas seul** (pä′ söl′), [Fr.], سەمای یەك کەسی.
**passible** (pas′ə-b'l), *adj.* هەستیار؛ هەست ناسك.
**passim** (pas′im), *adv.* [L.], لە هەموو شوێنێکی کتێبەکەدا هەیە: ووشەیەکە لە ڕوونکردنەوەی پەرتووکێکدا بەکاردەهێنرێ بۆ پەنجە ڕاکێشان بۆ ووشەیەکی زۆر بەکارهاتوو لەو پەرتووکەدا.
**passing** (pas′iŋ, päs′iŋ), *adj.* (١) تێپەڕبوو (پیادا، بەلادا، یا بەسەردا). (٢) سەردەمی؛ کاتی؛ کەم خایەن؛ زوو لەناوچوو.
(٣) لامسەرلایی؛ بەبێ بیرلێکردنەوە: *( a ~ remark)* .
(٤) دەرچوو (نمرە): *( She got a ~ grade in chemistry.)* .
(٥) هی ئێستا؛ تازە.
(٦) [Archaic]، زۆر؛ بەدەر؛ ئێجگار زۆر.
*adv.* [Chiefly Archaic], زۆر؛ ئێجگار زۆر.
*n.* (١) پیادا ڕۆیشتن؛ بەناودا یا بەسەردا ڕۆیشتن؛ تێپەڕبوون
(٢) هۆی تێپەڕبوون یا پەڕینەوە؛ شوێنی تێپەڕبوون.
(٣) [Poetic]، مردن؛ کۆچی دوایی کردن.
**in passing,** بە لامسەرلایی؛ بە ڕێکەوت؛ بەبێ زۆر بیرلێکردنەوە:
*( He mentioned it in passing.)*
**passing bell,** زەنگی مردن (بە بۆنەی مردنی کەسێکەوە لێدەدرێ).
**passion** (pash′ən), *n.* (١) ئێش و ئازاری گیانبەخش؛ تالاو.
(٢) [P-]، (ا) ئێش و ئازاری مەسیح لەکاتی هەڵواسین یا لەکاتی نێوان دوا شێو و هەڵواسیندا. (ب) باسی ئەم ئازارە لە ئینجیلدا.
(ج) دەربڕینی ئەم ئازارە لە پارچەیەك مۆسیقا یا تابلۆیەکدا.
(٣) (ا) هەست؛ سۆز. (ب) هەستێکی تایبەتی (وەك توورەیی، خۆشی... هتد).
(٤) هەستێکی زۆر بەتین، بەتایبەتی: (ا) توورەیییەکی زۆر.
(ب) حەز؛ حەزلێکردن (هونەر، وەرزش... هتد)؛ جۆش:
*( She has a ~ for music.)*
(ج) خۆشەویستی؛ خۆشویستن. (د) حەزی بەتینی جووت بوون؛ جۆش
(٥) شتێك کە جێی هەستێکی بەتین بێت.
**passional** (pash′ən-'l), *adj.* هەستی؛ سۆزی؛ جۆشی.
*n.* پەرتووکی ئێش و ئازاری گیانبەخشان و پیاوچاکان (خاچ پەرستی).
**passionate** (pash′ən-it), *adj.* (١) بەسۆز؛ بەهەست؛ هەستدار؛ بەئاسانی دێتە جۆش. (٢) سەرگەرم؛ زوو هەڵچوو؛ تووڕەوتڕۆ.
(٣) بەتین؛ بەسۆز؛ لە دڵەوە؛ خەڵك هێنەرە جۆش: *( a ~ speech)* .
(٤) بەجۆش (جووت بوون)؛ بەئاڵۆش؛ بەهەوەس؛ چاوچڵێس.
(٥) قووڵ (هەست)؛ توند و تیژ.

-passionately *(adv.).*

**passionflower** (pash′ən-flou′ẽr), *n.* گوڵە ئازار (گوایە بەشێك لە گوڵەكەی لە بریني عیسا دەچێ)؛ گوڵە سەعاتی.

**passion fruit,** بەری گوڵە ئازار (وشەی پێشوو ببینە)

**passionless** (pash′ən-lis), *adj.* بێ هەست؛ سارد؛ لەسەرخۆ؛ هێمن.

**Passion play,** شانۆنامەی ئازاری عیسا.

**Passion Sunday,** یەك شەممەی ئازار: دووەم یەك شەممەی پێش جەژنی هەڵواسین و زیندووبوونەوەی عیسا.

**passive** (pas′iv), *adj.* (١) كارتێكراو؛ كار نەكەرە سەر هیچ شتێك. (٢) بەرهەڵستی نەكەر؛ مل كەچ؛ لاشەر؛ خوێن سارد. (٣) هیچ نەكەر؛ ناكارا؛ ناچالاك. (٤) بێ جووڵە (كیمیا)؛ تێن لێ براو. (٥) كارلێكراو (رێزمان)؛ ناكارا؛ تایبەتی بە رستەیەكە كە كاراكەی كاری لێ كرابێ نەك كاركەر بێ؛ هی كرداری رستەیەكە كە كار نەكاتە سەر شتێك، وەك: " was struck " لەم رستەیەدا:

*( The tree was struck by lightning.)*

(٦) بێ قازانج (بەشی كۆمپانیای هاوبەش)؛ قازانج نەدەر. (٧) سستی (پزیشكەوانی)؛ خاوی.

*n.* (١) باری ناچالاكی كردار لە رستەدا (رێزمان)؛ رستەیەكە كە كردارەكەی نادیار بێ. (٢) كرداری ناچالاك؛ كرداری نادیار.

**passive resistance,** بەرهەڵستی كردنی میریی زۆردارو یاساكانی لەرێگەی مل نەدان و هاوكاری لەگەڵ نەكردنی نەك لەرێگەی خوێن رشتنەوە.

**passivism** (pas′iv-iz′m), *n.* ناچالاكی؛ هیچ نەكردن؛ مل كەچی؛ هەڵوێستی ناهاوكاری؛ لاشەری.

-passivist *(n.).*

**passivity** (pa-siv′ə-ti), *n.* مل كەچی؛ هیچ نەكردن؛ ناچالاكی.

**passkey** (pas′kē′, päs′kē′), *n.* (١) master key. (٢) كلیلی تایبەتی.

**passport** (pas′pôrt′, päs′pōrt′), *n.* (١) گوزەرنامە؛ پەساپۆرت. (٢) هۆی سەركەوتن، پەسەندكران، یا بە ئامانج گەیشتن:

*( His wit was his ~ .; Her good look was her ~ .)*

**password** (pas′wũrd′, päs′wũrd′), *n.* ووشەی نهێنی؛ ووشەی تێپەڕبوون (بەلای پاسەواندا)؛ پەڕلە.

**past** (past, päst), *adj.* (١) دوایی هاتوو؛ تەواوبوو؛ نەماو

*( His worries are ~ .)*

(٢) جاران؛ پێشوو؛ كۆن؛ كاتی كۆن؛ بەروو. (٣) رابوردوو؛ پێشوو: *( the ~ week)*. (٤) هی پێشوو: *( a ~ chairman)*. (٥) رابوردوو (رێزمان)؛ نیشانەی كاتی رابوردوو.

*n.* (١) رابوردووی كەسێك (بەتایبەتی رابوردوویەكی لەكاوی):

*( The actress was found to have a ~ .)*

(٢) (أ) كاتی رابوردوو (رێزمان). (ب) كردارێكە كە كاتی رابوردوو نیشان بدات.

*prep.* (١) زووتر لە؛ كۆنتر لە. (٢) دوورتر لە. (٣) زیاتر لە (پلە، بڕ). (٤) بەدەر؛ بەولاوە: *( It's ~ belief.)*.

*adv.* بەدەر؛ بەولاوە (كات، شوێن).

**the past,** رابوردوو؛ كۆن؛ كاتی كۆن؛ رۆژانی رابوردوو.

**pasta** (päs′tə), *n.* (١) هەویری مەعكەرۆنی و سپاگێتی و خواردەمەنی تری ئیتالی؛ مەعكەرۆنی؛ سپاگێتی. (٢) ژەمێك خواردنی مەعكەرۆنی و سپاگێتی یا خواردەمەنی تری ئیتالی.

**paste** (pāst), *n.* (١) هەویری شیرینی. (٢) گیراوە؛ شلە؛ شتی گیراوە (دەرمانی ددان، بۆیە، دۆشاوی تەماتە): *( tooth ~ ; tomato ~ )*. (٣) شیرینییەكی جەلاتینییە. (٤) قوڕی گڵێنەكاری. (٥) سرێش؛ هێلم. (٦) جۆرە شووشەیەكی بریقەدارە (خشڵی دەستكردو هەرزانبەهای لێ دروست دەكرێ). (٧) [Slang]. مستەكۆڵە

*v.t.* (١) پێوە نووساندن بە سرێش؛ پێوەنان؛ پێوە چەسپكردن. (٢) داپۆشین بە شتی سرێش لێدراو. (٣) [Slang]، مستەكۆڵە پیادان؛ لێدان

**pasteboard** (pāst′bôrd′, pāst′bōrd′), *n.* (١) كاغەزی كارتۆن؛ مقەبا. (٢) [Slang]، شتێكی دروستكراو لە كاغەزی ئەستوور یا مقەبا (وەك كاغەزی قومار، بلیت... هتد).

*adj.* (١) مقەبایی؛ كارتۆنی. (٢) درۆزنە؛ ناسك؛ شەق وشڕ؛ پووكەشی.

**pastel** (pas′tel), *n.* (١) پوورەكێكە خوم یا رەنگی شین لە گەڵاكەی دەگیرێ. (٢) خوم یا رەنگی شینی گیراو لە گەڵای ئەم پووەكە.

**pastel** (pas-tel′, pas′tel), *n.* (١) (أ) گیراوەیەكە قەڵەم بۆیەی لێ دروست دەكرێ. (ب) قەڵەم بۆیەیەكی لەم گیراوەیە دروستكراو (٢) وێنەی بەم قەڵەم بۆیەیە كێشراو. (٣) نیگاركێشان بە قەڵەم بۆیەی وەها. (٤) رەنگێكی كاڵ و ناسك. (٥) كورتە باسێكی پەخشانی.

*adj.* كاڵ و ناسك (رەنگ).

**pastelist, pastellist** (pas′tel-ist, pas-tel′ist), *n.* وێنەكێشی تابلۆی رەنگ كاڵ و ناسك.

**pastern** (pas′tẽrn), *n.* (١) مەچەكی ئەسپ. (٢) مەچەكی سەگ و گیانداری چوارپێی تر

**pasteurization** (pas′tẽr-i-zā′shən, pas′chẽr-ī-zā′shən), *n.* خاوێن كردن بە كوڵاندن و میكرۆب كوشتن (شیر، بیرە)؛ پوختەكردن.

**pasteurize** (pas′tẽr-īz′, pas′chẽr-īz′), *v.t.* پوختەكردن؛ خاوێن كردنی شیرو بیرە بە كوڵاندن و میكرۆب كوشتن.

**pasticcio** (päs-tēt′chô), *n.* پارچەیەك مۆسیقا یا بەرهەمێكی وێژەیییە كە لە چەند سەرچاوەیەكەوە وەرگیرابێ یا دزرابێ.

**pastiche** (pas-tēsh′, päs-tēsh′), *n.* (١) بەرهەمێكی مۆسیقایی یا وێژەیییە كە لاسایی بەرهەمێكی تر دەكاتەوە بۆ لاقرتێ پێكردنی. (٢) كۆمەڵێك شتی جۆراوجۆر؛ كۆمەڵێكی هەرەمەی وەك چێشتی مجەور

**pastille** (pas-tēl′), *n. Also* pastil, (١) لەبزینەی دەرمان؛ لەبزینەی دەرماناوی. (٢) كولۆیەكی بۆنداره لە ژوورێكدا دەسووتێنرێ بۆ هەوا پاكردنەوەو بۆن خۆشی. (٣) گیراوەی قەڵەم بۆیە لێ دروستكردن. (٤) قەڵەم بۆیەیەی لەم گیراوەیە دروستكراو.

**pastime** (pas′tīm′, päs′tīm′), *n.* شتی كات پێ بردنەسەر؛ شتی كات پێ رابواردن؛ رابواردن.

**past master,** (١) سەرۆكی پێشووی یانە یا كۆمەڵەیەك. (٢) وەستا؛ كەسێكی شارەزا لە پیشەیەكدا.

**pastor** (pas′tẽr, päs′tẽr), *n.* (١) شوان. (٢) قەشە؛ سەرپەرشتیكەری كڵێسەی ناوچە یا گەڕەكێك.

**pastoral** (pas′tẽr-əl, päs′tẽr-əl), *adj.* (١) هی شوان و گاوان و شوانێتی. (٢) هی دەشت ودەرو باخ وباخات و مەڕوماڵات و شوانێتی. (٣) تایبەتی بە وێژەیەك كە لە ژیانی لادێ و شوانێتی دەدوێ. (٤) وەك ژیانی لادێ لە خۆشی و سادەییدا؛ خۆش و سادەو نزیك بە سرووشت؛ پڕ ئاسوودەو خۆشی. (٥) تایبەتی بە قەشەو كاروباری.

*n.* (١) هۆنراوەیەك یا شانۆنامەیەكە دەربارەی شوان و شوانێتی. (٢) وێژەی لە ژیانی لادێ و شوان دوواو. (٣) دیمەنی لادێ. (٤) پەرتووكێكە دەربارەی ئەركی قەشە. (٥) نامەیەكە لە سەرەك قەشەوە بۆ ئەندامانی كڵێسە یا قەشەكان. (٦) گۆرزی سەرەك قەشە. (٧) pastorale.

-pastoralism *(n.)*; pastoralist *(n.).*

**pastorale** (pas′tə-rä′li), *n.* (١) پارچە ئاوازێكە دەربارەی ژیانی پڕ ئاسوودەیی لادێ و شوانی. (٢) ئۆپێرایەكە دەربارەی ژیانی لادێ و شوانی و مەڕوماڵات.

**pastoral staff,** گۆرزی سەرەك قەشە

**pastorate** (pas′tẽr-it, päs′tẽr-it), *n.* (١) سەرەك قەشەیەتی؛ قەشەیەتی؛ ئەركی قەشە یا سەرەك قەشە. (٢) ماوەی قەشەیەتی قەشەیەك لە كڵێسەدا. (٣) دەستە قەشە؛ سەرجەمی قەشەكان

**past participle,** شێوەی گەردانی سێهەمی كردارە وەك ئاوەڵناو

بەکاردەهێنرێ: ( " finished work " و " baked potatoes ")، وە وەك شێوەکرداریش بۆ دەربڕینی سەردەمی ڕابوردوو بەکاردەهێنرێ (ڕێزمان):
*( The work was finished.; She had baked the potatoes.)*

**past perfect,** ڕابوردووی دوور (ڕێزمان)؛ ڕابوردووی تەواو؛ شێوەیەکی کردارە کە تەواوبوونی کارێك دەگەیەنێ لەپێش کارێکی تردا یا لەپێش کاتێکی تایبەتی ڕابوردوودا (وەك: " had locked ") لەم ڕستەیەدا:
*( He had locked the door before he left.)*

**pastrami** (pə-strä′mi), *n.* باستەرمە

**pastry** (pās′tri), *n.* (١) هەویری شیرینی
(٢) شیرینی وەك کێك و کولیچە و پاقلاوە... هتد.

**past tense,** کاتی ڕابوردوو (ڕێزمان)

**pasturage** (pas′chēr-ij, päs′chēr-ij), *n.* (١) لەوەڕ.
(٢) (ا) لەوەڕگا. (ب) مافی بەکارهێنانی لەوەڕگا
(٣) ئاژەڵ و وڵاغ لەوەڕاندن؛ لەوەڕاندن.

**pasture** (pas′chēr, päs′chēr), *n.* (١) لەوەڕ
(٢) لەوەڕگا؛ پاوان؛ پاکژ

***v.t.*** (١) لەوەڕاندن. (٢) لەوەڕین.

***v.i.*** لەوەڕین؛ لەوەڕ خواردن

**-pasturer** *(n.).*

**pat** (pat), *adj.* (١) لەکاتی خۆیدا؛ بەجێ؛ سازن؛ ئامادە: *( a ~ answer)*.
(٢) تەواو؛ ڕاست؛ لە جێی خۆیدایەتی.

***adv.*** (١) لەکاتی خۆیدا بوو؛ لە جێی خۆیدا بێ کەم و زیاد: *( The reply came ~ .)* (٢) ئامادە

**have ( or know ) down pat,** هەمووی باش تێگەیشتن؛ هەمووی زانین؛ هەمووی باش لەبەربوون.

**stand pat,** [Colloq.]. (١) سووربوون لەسەر؛ لە ڕای خۆ لانەدان
(٢) کاغەزی تر ڕانەکێشان (یاری قومار)

**pat** (pat), *n.* (١) لێدانێکی بەنەسپایی بە دەست یا بە پەنجە؛ دەست پیاداهێنانی گورج و بەنەسپایی (٢) دەنگی ئەم دەست پیادانە؛ تەپە؛ دەنگی بە دەست لێدان. (٣) قالب (کەرە)

***v.t.*** (١) دەست پیادان بەنەسپایی؛ تەپە لێ هەڵسانەدن بە شتێکی تەخت بەنەسپایی. (٢) ڕێك وپێك کردن بە دەست پیادان بەنەسپایی و پەیتاپەیتا (گونکە هەویر، تۆپەڵە قوڕ لە گڵینەکاریدا).

***v.i.*** تەپەتەپ کردن لە ڕێکردندا.

**pat someone ( or oneself ) on the back,** ئافەرین کردن؛ دەست بە پشتدا دان بۆ ئافەرین کردن یا پیرۆزبایی سەرکەوتن لێکردن.

**patagium** (pə-tā′ji-əm), *n.* (١) پەردەیەکی باڵ ئاسایییە لە شەمشەمەکوێرەدا. (٢) پەردەی کشاوی بەینی باڵ و لەشی باڵندە.

**patch** (pach), *n.* (١) پینە. (٢) سەرغێ لە برینەوە پێچراو.
(٣) پینەی چاو
(٤) پارچەیەك قوماشە لەسەر قۆڵی کراس و چاکەتی سەرباز دەدرێ وەك نیشانە. (٥) پارچەیەك قوماشی بچکۆلەی ڕەشە ژن دەیدات لە دەموچاوی یا پشتی وەك ئارایشت.
(٦) پەڵە؛ پەڵەی جیاواز لە دەوروبەری: *( ~es of blue sky)*
(٧) (ا) پەڵە زەوی؛ پارچە زەوی: *( a ~ of desert land; a potato ~ )*.
(ب) بەرهەمی پەڵە زەوییەکی وەها. *( a ~ of grass, beans, etc.)*.
(٨) پێنك؛ پارچە؛ سەرەمقەست.

***v.t.*** (١) پینەکردن؛ دوورینەوە
(٢) بە پارچەی جۆراوجۆر و هەمەڕەنگ دروستکردن (وەك لێفە).
(٣) ( ~ up; ~ together )، چاکردن بەپەلە و بەلاسەرلایی؛ پینەکردن

**patch up,** ڕێکەوتن (دوو کەس یا لای ناکۆك)؛ برینەوە (ناکۆکی)؛ ڕێکخستن؛ پینەکردن. *( They patched up their differences.)*.

**-patchable** *(adj.).*

**patchouli** (pach′oo-li, pə-chōō′li), *n.* (١) نەعنای هیندی
(٢) بۆنێکە لە ڕۆنی ئەم نەعنایە دەگیرێ (هەروەها " patchouly ").

**patch pocket,** گیرفانێکە بە دەرەوەی چاکەت یا بەرگی ترەوە دەدوورێ وەك پینە.

**patchwork** (pach′wûrk′), *n.* (١) پینەکاری؛ پارچەی جۆراوجۆری بەیەکەوە دووراو و کراو بە بەرگی لێفە. (٢) نەقشکاری بەرگە لێفەیەکی وەها.
(٣) شتی پارچە پارچە و پیناوی؛ شتی تێکەڵاو و جۆراوجۆر و ناڕێك

**patchy** (pach′i), *adj.* (١) (ا) پیناوی: *( a ~ pair of trousers)*.
(ب) لە پینە چوو. (٢) پچڕپچڕ؛ پارچە پارچە؛ ناڕێك وپێك؛ یەك نەوا نییە؛ هەمووی وەك یەك باش نییە: *( ~ work)*.

-patchily *(adv.)*; patchiness *(n.)*.

**pate** (pāt), *n.* (١) سەر. (٢) تەوقەسەر.
(٣) زیرەکی (لەڕووی گاڵتە یا لاقرتێوە).

**pâte** (pät), [Fr.], (١) کولیچەی گۆشت یا ماسی.
(٢) جگەر یا گۆشتی وورد کراو وەك هەویر لێکراو بۆ هەڵسوون لە نان و پسکیت.

**patella** (pə-tel′ə), *n.* (١) تاوەی بچووکی پەل.
(٢) **kneecap** . (٣) ئەندامی لە تاوەچوو (زیندەوەرزانی، ڕووەکناسی).

**paten** (pat′′n), *n.* (١) دەوری یا دەفری خوانی قوربانی لە کڵێسەدا.
(٢) دەوری؛ قاپ. (٣) خەپڵەی کانزایی تەنك.

**patency** (pā′t′n-si), *n.* (١) ڕوونی؛ ئاشکرایی؛ دیاری.
(٢) ڕێ لێ نەگیران (پزیشکەوانی)؛ بەر بەرەڵایی.

**patent** (pat′′nt), *adj.* (١) (ا) کراوە (بڕوانامەیەك بۆ پشکنینی جەماوەر) ؛ ئاقەدەغە. (ب) کراوەتەوە بۆ هەمووکەس. (٢) ئاشکرا؛ دیار؛ ڕوون
(٣) بەر بەرەڵا؛ ڕێ بۆ کراوە.
(٤) پارێزراو یا قەدەغەکراو بە مافی داهێنانی تازە.
(٥) تازە (شێواز، ڕێ، هۆ)؛ نوێ و ئەنتیکە؛ نائاسایی:
*( a ~ method of lighting a fire)*
(٦) نایاب (ئارد).
(٧) تەرز فرێدەر؛ پەرەسەندوو؛ بڵاوبووەوە.

***n.*** (١) مافنامەی دانان: بڕوانامەیەکە میری دەیبەخشێ بە داهێنەری شتێکی تازە کە مافی بەکارهێنان و بەرهەم هێنان و فرۆشتن و کەڵك لێ وەرگرتنی ئەدات بە داهێنەرەکە بۆ ماوەیەکی تایبەتی: *( to get a ~ )*.
(٢) (ا) ئەم مافنامەیە.
(ب) ئەو داهێنراوەی بەم مافنامەیە دەپارێزرێ بۆ داهێنەرەکەی.
(٣) (ا) بەخشینی زەوی میری بە کەسێك. (ب) بڕوانامە یا تاپۆی ئەم بەخشینە.
(ج) زەوی بەخشراو بەم جۆرە.
(٤) مافی تایبەتی؛ قۆرخ؛ تاپۆ (مەجاز): *( She had no ~ on charm.)*.

***v.t.*** (١) وەرگرتنی مافی داهێنانی تازە (ژمارە یەك ببینە)؛ تۆمارکردنی داهێنراوی تازە بۆ پاراستنی (لەوەی کە کەسێکی تر بیکات بە هی خۆی) و بڕوانامەی داهێنان وەرگرتن: *( to ~ a new invention)*.
(٢) [Rare]، مافی داهێنانی تازە پێدان.

**patentee** (pat′′n-tē′), *n.* خاوەنی مافی داهێنانی تازە.

**patent leather,** قایشی بریقەداری ڕەقی ڕەش.

**patently** (pā′t′nt-li, pat′′nt-li), *adv.* بەئاشکرا؛ لەڕوو؛ بێ پێچ وپەنا.

**patent medicine,** دەرمانێکە کە بە مافی داهێنانی تازە پارێزراوە و بەبێ ڕەچەتە دەکڕێت.

**Patent Office,** فەرمانگەی مافی داهێنانی تازە بەخشین.

**patentor** (pat′′n-tēr), *n.* بەخشندەی مافی داهێنانی تازە.

**patent right,** مافی داهێنانی تازە.

**pater** (pā′tēr), *n.* [Chiefly British Colloq.], = **father.**

**paterfamilias** (pā′tēr-fə-mil′i-əs), *n.* گەورەی ماڵ (نێرینە)؛ باوك.

**paternal** (pə-tūr′n′l), *adj.* (١) باوکی؛ باوکێتی؛ باوکانە.
(٢) لە باوکەوە بۆ ماوەتەوە. (٣) هی باوکی؛ لەلای باوکییەوەیە:
*( ~ grandparents; ~ aunt)*

**paternalism** (pə-tûr'n'l-iz'm), ***n.*** شێوەی باوکانە. پەیوەندییەکە وەك هی باوك و منداڵ کە میری پەیڕەوی دەکات لەگەڵ گەلدا یا کەسێکی بەدەسەڵات لە ڕەفتارکردنیدا لەگەڵ ئەوانەی بەردەستی.

**paternalistic** (pə-tûr'n'l-is'tik), ***adj.*** باوکانە (هەندێ جار لەڕووی ناپەسەندییەوە بەتایبەتی لە ڕەفتارکردنی کەسێکی خۆ بە زل زان لەگەڵ یەکێکی خوارەدەستیدا کە بە هیچ و پووچ و منداڵی دادەنێ)؛ تایبەتی بە کۆمەڵگایەك کە پیاو شتی بەدەستە نەك ژن: ***( a ~ attitude; a ~ society)***

**-paternalistically** ***(adv.).***

**paternity** (pə-tûr'nə-ti), ***n.*** (١) باوکێتی؛ باوکی. (٢) سەرچاوە؛ بنچینە.

**paternoster** (pā'tĕr-nos'tĕr, pat'ĕr-nos'tĕr), ***n.*** (١) نزای خواوەند (خاچ پەرستی). (٢) (ا) دەنکە تەزبیحی نزاپێکردن. (ب) تەزبیحی وەها. (٣) نزا؛ دوعا.

**path** (path, päth), ***n.*** (١) ڕێچکە؛ باریکەڕێ؛ توولەڕێ؛ لاڕێ؛ گوزەر؛ پیادەڕێ. (٢) ڕێباز؛ ڕێگەی ژیان؛ ڕێ؛ ڕێڕەو: ***( the ~ of righteousness)***

**pathetic** (pə-thet'ik), ***adj.*** (١) (ا) جێی داخە؛ ناخۆش؛ پڕ لە ناخۆشی؛ هەست جوولێن: ***( a ~ sight, situation, etc.)*** (ب) کەساس؛ شایستەی بەزەیی پیاهاتنەوە؛ کوڵۆڵ و داماو: ***( a ~ person)*** (٢) هەستی؛ تایبەتی بە هەست.

**-pathetically** ***(adv.).***

**pathetic fallacy,** هەستی نادەمیزادانە دانەپاڵ شتی بێ گیان: ***( the angry sea; a stubborn wind; a sad day)***

**pathfinder** (path'fīn'dĕr, päth'fīn'dĕr), ***n.*** پێشڕەو؛ ڕێی تازە دۆزەرەوە.

**pathless** (path'lis, päth'lis), ***adj.*** ڕێگەی پیادا نەبراوە؛ کەس پیایدا نەڕۆیشتووە؛ نەزانراو.

**patho-** (path'ō, path'ə), ***Also*** **path-,** پێشگرێکە بەمانای: نەخۆشی؛ ئێش و ئازار؛ هەست: ***( pathology)***

**pathogen** (path'ə-jen), ***n.*** میکرۆب؛ هەر زیندەوەرێکی گەردبینی کە ببێتە هۆی نەخۆشی

**pathogene** (path'ə-jēn'), ***n.*** = **pathogen.**

**pathogenesis** (path'ə-jen'ə-sis), ***n.*** نەخۆشی پەیدابوون؛ نەخۆشی کەوتنەوە و پەرەسەندن.

**pathogenetic** (path'ō-jə-net'ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە نەخۆشی پەیدابوون. (٢) دەبێتە هۆی نەخۆشی (میکرۆب)؛ بۆی هەیە ببێتە هۆی نەخۆشی: ***( ~ bacteria)***

**pathogenic** (path'ə-jen'ik), ***adj.*** = **pathogenetic.**

**pathogeny** (pə-thoj'ə-ni), ***n.*** = **pathogenesis.**

**pathological** (path'ə-loj'i-k'l), ***adj.*** ***Also*** pathologic, (١) تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی نەخۆشی. (٢) هی نەخۆشی؛ هۆکەی نەخۆشییە؛ لە نەخۆشییەوە پەیدادەبێ. (٣) وەك نەخۆشی وایە؛ تێکچوو؛ ڕەفتارەکەی وەك نەخۆشییەو بەدەست ئەو کەسە خۆی نییە: ***( He is a ~ liar.)***

**pathologist** (pə-thol'ə-jist), ***n.*** نەخۆشی ناس؛ زانای نەخۆشی (بەتایبەتی ئەوەی کە لە تاقیگەی پزیشکیدا کاردەکات).

**pathology** (pə-thol'ə-ji), ***n.*** (١) زانستی نەخۆشی و پەیدابوونی و پەرەسەندنی و ئەنجامەکانی؛ نەخۆشی زانی. (٢) نیشانەکانی نەخۆشی؛ ئەنجامەکانی نەخۆشی.

**pathos** (pā'thos), ***n.*** (١) [Rare] ، ئێش و ئازار. (٢) ئەو شتەی کە لە دیمەنێکدا یا بەسەرهاتێکدا دەبێتە هۆی هاوسۆزی و بەزەیی پیاهاتنەوە. (٣) بەزەیی پیاهاتنەوە؛ هاوسۆزی. (٤) ئەو لایانەی هونەر و بەرهەمی هونەری کە پەیوەندییان هەیە بە هەستەوە.

**pathway** (path'wā', päth'wā'), ***n.*** = path.

**-pathy** (pə-th'i), پاشگرێکە بەمانای: هەست؛ ئێش و ئازار؛ نەخۆشی؛ چارەکردنی نەخۆشی؛ دەرمانکردن: ***( antipathy, osteopathy)***

**patience** (pā'shəns), ***n.*** (١) ئارام گرتن؛ خۆگرتن؛ سەبر؛ تاقەت؛ دان بەخۆداگرتن؛ دەربڕدن. (٢) [Cheifly British]، یارییەکی کاغەزی یەك کەسییە

**patient** (pā'shənt), ***adj.*** (١) بەئارام؛ ئارامگر؛ دان بەخۆداگر. (٢) کۆڵنەدەر؛ خۆراگر؛ بەتاقەت؛ دەربەر.

***n.*** نەخۆشێکە کە لەژێر چاودێری پزیشکدا بێت؛ نەخۆش: ***( There are fifty ~s in the hospital.)***

**patiently** (pā'shənt-li), ***adv.*** بەئارامەوە؛ بەبێ پەلەکردن؛ لەسەرخۆ.

**patina** (pat'i-nə), ***n.*** دەوری؛ قاپی دەم پل

**patina** (pat'n-ə), ***n.*** ڕەنگی سەوزکاری مس و زەرد.

**patio** (pä'ti-ō', pat'i-ō'), ***n.*** (١) هەیوان؛ بەرهەیوان. (٢) حەوشەی دەورگیراوی ناوەوە.

**patois** (pat'wä), ***n.*** (١) شێوەزمانی بازاڕی ناوچەیی فەرەنسی. (٢) (ا) شێوەزمانی ناوچەیی. (ب) شێوەزمانی بازاڕی یا نەخوێندەواران. (٣) شێوەزمانی تایبەتی پیشەگەرییەك.

**patri-** (pat'rə, pat'ri), پێشگرێکە بەمانای: باوك؛ باوکی: ***( patrimony)***

**patriarch** (pā'tri-ärk'), ***n.*** (١) باوك؛ سەرگەورەی خێزان یا تیرە (وەك یەکێك لە پێغەمبەرەکانی ناوبراو لە قورئان و ئینجیل و تەوراتدا)؛ پەتریارك (٢) دامەزرێنەر (ئاین، ڕێگەی ژیان، بازرگانی، کۆمەڵگا ... هتد). (٣) سەرەك قەشە؛ کاربەدەستێکی گەورەی کڵێسە. (٤) پیاوێکی زۆر بەشکۆ و بەتەمەن. (٥) بەتەمەنترین یا گەورەترین کەسی کۆمەڵێك یا دەستەیەك؛ سەرگەورە.

**patriarchal** (pā'tri-är'k'l), ***adj.*** ***Also*** **patriarchic,** (١) بەشکۆ. (٢) تایبەتی بە ڕژێمێکی کۆمەڵایەتییە کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی تیایدا بەدەست پیاوە: ***( a ~ social system or society)*** (٣) لەژێردەستی سەرەك قەشە یا پەتریارکدایە.

**patriarchate** (pā'tri-är'kit), ***n.*** ناوچەی ژێردەستی سەرەك قەشە یا پەتریارك؛ پەتریارك نشین.

**patriarchy** (pā'tri-är'ki), ***n.*** (١) ڕژێمی باوکی؛ ڕژێمێکی کۆمەڵایەتییە بریتییە لە فەرمانڕەوایی باوك (وە نێرینەکان) بەسەر خێزان و تیرەدا و منداڵ چوونەوە سەر باوك و بنەچەی باوك نەك هی دایك (٢) فەرمانڕەوایی باوکی؛ کۆمەڵگایەکە کە لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی باوکدایە نەك هی دایك

**patrician** (pə-trish'ən), ***adj.*** (١) بەگزادەیی؛ ئەرستۆکراتی. (٢) بۆ بەگزادە دەشێ؛ لە ئەرستۆکراتی دێت.

***n.*** (١) بەگزادە یا ئەرستۆکراتییەکی ڕۆمانی (٢) کاربەدەستێکی گەورەی ڕۆمانی لە یەکێك لە ناوچەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانی کۆن (٣) خانەدان؛ خانزادە؛ بەگزادە.

**patriciate** (pə-trish'i-it, pə-trish'i-āt'), ***n.*** (١) بەگزادەیی؛ پلەوپایەی بەگزادە یا خانزادە. (٢) چینی بەگزادە یا خانزادە

**patricide** (pat'rə-sīd'), ***n.*** (١) باوکی خۆکوشتن. (٢) باوکی خۆکوژ.

**-patricidal** ***(adj.).***

**patrilineal** (pā'trə-lin'i-əl, pat'rə-lin'i-əl), ***adj.*** باوکی نەك دایکی (خزمایەتی، بنەچە دۆزینەوە، ناو بۆ مانەوە، میراتی)؛ لەڕێی باوکەوە نەك دایکەوە.

**patrimony** (pat'rə-mō'ni), ***n.*** (١) میراتی لە باوکەوە یا لە باوو باپیرەوە بۆ ماوە؛ میراتی (٢) کەلەپوور. (٣) زەوی و زار و شتی تری بە کڵێسە بەخشراو.

**-patrimonial** ***(adj.).***

**patriot** (pā'tri-ət, pā'tri-ot'), ***n.*** کەسێکی نیشتمانپەروەر؛ نیشتمان پەرست؛ نیشتمانپەروەر.

**patriotic** (pā'tri-ot'ik), ***adj.*** نیشتمانی؛ نیشتمانپەروەر؛ نیشتمان پەرست.

**-patriotically** ***(adv.).***

**patriotism** (pā'tri-ət-iz'm), ***n.*** نیشتمانپەروەری؛

نیشتمانپەروەریتی؛ نیشتمان پەرستی

**patristic** (pə-tris′tik), *adj.* تایبەتی بە دامەزرێنەرو سەرۆکەکانی کۆنی کلێسەو نووسینەکانیان

**patrol** (pə-trōl′), *v.t. & v.i.* پاسکردن

*n.* (١) پاسەوان؛ نۆبەچی؛ حەسحەس. (٢) دەستەی دیدەوانان.

**-patroler** *(n.)*.

**patrol car,** ئوتومبیلی پاسەوان.

**patrolman** (pə-trōl′mən), *n.* پاسەوان؛ نۆبەچی؛ حەسحەس.

**patrol wagon,** ئوتومبیلی گواستنەوەی بەند

**patron** (pā′trən), *n.* (١) سایەدار؛ پارێزەر؛ لایەنگیر؛ پشتیوان (بەتایبەتی بە پارە): *( a ~ of the arts)*.

(٢) کڕیاری سەروەر (فرۆشگا. چێشتخانە... هتد)؛ مەعمیل.

(٣) لە ڕۆمای کۆندا کەسێك بوو کە بەندەکەی ئازادکردبوو، بەڵام هێشتا هەر لەژێر ڕکێفیدا بوو.

**patronage** (pā′trən-ij, pat′rən-ij), *n.* (١) پشتیوان کردن بە پارە؛ سایە؛ پشتیوانی؛ پاراستن؛ لایەنگیری کەسێکی سایەدار.

(٢) خۆ بە زلتر دانان لە خەڵك؛ بە جوانی لەگەڵ جوڵانەوە لەبەر لە خۆ بە کەمتر دانان. (٣) سەوداگەری سەروەر لەگەڵ فرۆشگا، چێشتخانە، میوانخانە یا شوێنێکی بازرگانی تردا. (٤) کڕیاران؛ مەعمیلەکان؛ سەوداگەران.

(٥) دامەزراندنی فەرمانبەرانی میری بە خاترو خوایشت نەك بەپێی توانا؛ دەسەڵاتی ئەم دامەزراندنە.

(٦) ئەو نیشانەی میری کە دەبەشرێنەوە بە خاترو خوایشت.

**patroness** (pā′trən-is, pat′rən-is), *n.* سایەداری ئافرەت

**patronize** (pā′trə-nīz′, pat′rə-nīz′), *v.t.* (١) پشتیوانی کردن (بەتایبەتی بە پارە)؛ هێنانە ژێر سایەی خۆوە؛ پاراستن.

(٢) بە جوانی لەگەڵ جوڵانەوە لەبەر بە کەمتر دانان لە خۆ؛ بە سووك تەماشاکردن‌و لەگەڵ جوڵانەوە وەك خێرپێکردن: *( He often ~s his employees.)*

(٣) هەمیشە لێ کڕین: *( to ~ a shop)*.

**-patronizer** *(n.)*; patronizingly *(adv.)*.

**patron saint,** پیری سایەداری شوێنێك. کەسێك. یا دەزگایەك

**patronymic** (pat′rə-nim′ik), *adj.* هی نازناوی باوك یا باووباپیر.

*n.* (١) نازناوێکە کە پێشگر یا پاشگری پێوەبێت. وەك: " Johnson " " کوڕی جۆن " وە " McAdams " " کوڕی ئادەمز " ).

(٢) نازناو؛ سەرناو

**patsy** (pat′si), *n.* [Slang]. کەسێکی قەشمەری؛ گاڵتەچی خەڵك.

**patten** (pat′'n), *n.* (١) قاپقاپ (٢) پێڵاوی بن بەرز.

**patter** (pat′ẽr), *v.t. & v.i.* بەپەلە یا لەبەرخۆوە وتن.

*n.* (١) شێوەزمانی تایبەتی پیشەگەرییەك (کە کەسی تر بە باشی تێی ناگات).

(٢) زۆر خێرا قسەکردن؛ زمان لووسی

(٣) [Colloq.]، قسەی بێ تام‌و هیچ‌وپووچ؛ هەڵەوەڕی.

**pattern** (pat′ẽrn), *n.* (١) نموونە (٢) قالب

(٣) نەخشە (وەك هی جل لەسەر دوورین): *( a dress ~ )*.

(ب) نەخشە بەتایبەتی هی جوان وەك هی قاڵی و بەرەو جل‌وبەرگ).

(٤) وێنە (٥) شێوازی هەمیشە دووبارەکراوە؛ بابەت: *( behavior ~s)*.

(٦) شێواز؛ شێوە (٧) بەشی دەستێك جل یا کراسێك لە قوماش.

*v.t.* (١) ( ~ on; ~ upon; ~ after )، لەسەر نەخشەیەك کردن؛ لاسایی کردنەوەی نەخشەیەك؛ لەسەر نەخشەیەك کردن یا دەرهێنان: *( to ~ a dress on a Parisian model)*

(٢) ڕازاندنەوە یا داپۆشین بە نەخشەیەك

**patty** (pat′i), *n.* (١) کولیچە

(٢) خەپلەیەك گۆشتی هاڕراو یا ماسی (وەك شفتە): *( a Hamburger ~ )*.

**pausity** (pô′sə-ti), *n.* (١) ژمارەکەمی

(٢) کەمی؛ کەمێتی؛ کزی؛ نەبوونی؛ بەش نەکردن.

**paunch** (pônch), *n.* (١) وورگی زل؛ وورگ

(٢) یەکەم وورگی گیانداری کاوێژکەر.

**paunchy** (pôn′chi), *adj.* وورگ زل

**-paunchiness** *(n.)*.

**pauper** (pô′pẽr), *n.* (١) کەسێکە کە بە خێر دەژی.

(٢) کەسێکی هەژار؛ کەسێکی بێ پووڵ‌و پارە.

**pauperism** (pô′pẽr-iz'm), *n.* (١) هەژاری؛ بێ پووڵ‌و پارەیی.

(٢) هەژاران.

**pauperize** (pô′pẽr-īz′), *v.t.* هەژارکردن؛ بێ پووڵ‌و پارە کردن.

**pause** (pôz), *n.* (١) وەستانێکی کەم؛ وەستان؛ کورتە ووچان؛ هەڵوێستانەوە. (٢) وەستانێکی هەناسەیی یا زۆر کورت لە ووتار خوێندنەوە، یا ووتووێژ... هتد. (٣) ڕاڕایی؛ دوودڵی.

(٤) نیشانەی وەستانێکی کورت لە نووسیندا (خاڵبەندی).

*v.i.* (١) وەستان؛ هەڵوێستان؛ وەستان بۆ ماوەیەکی زۆر کەم؛ ڕاڕایی کردن.

(٢) ( ~ on; ~ upon )، وەستان‌و بیرلێکردنەوە؛ لەسەر مانەوە (دووان) درێژەپێدان: *( to ~ on a point)*.

**give one pause,** بوونە هۆی ڕاڕایی یا دوودڵی؛ نادڵنیاکردن؛ گومان لێ پەیدابوون

**pave** (pāv), *v.t.* قیرتاوکردن.

**pave the way (for),** ڕێ بۆ خۆش کردن؛ ڕێ بۆ کردنەوە؛ ڕێ بۆ تەخت کردن.

**pavement** (pāv′mənt), *n.* (١) ڕوویەکی چیمەنتۆکراو یا قیرتاوکراو (وەك شۆستە). (٢) ڕێگەی قیرتاو؛ شەقامی قیرتاوکراو.

(٣) قیرتاو؛ چیمەنتۆو زیخ‌و ووردەبەردی بەکارهێنراو لە شۆستەو ڕێگەی چاك کردندا.

**pavilion** (pə-vil′yən), *n.* (١) چادرێکی گەورە؛ سەیوان؛ کەپر یا ساباتێکی گەورە (٢) چەرداخی ناو باخێکی گشتی

(٣) بەشی پیشانگایەك یا خانوویەکی گەورە. (٤) کرکراگەی گوێ.

*v.t.* جێکردنەوە لەناو چادر یا ژێر سابات‌و سەیواندا.

**paving** (pāv′iŋ), *n.* (١) قیرتاوکردن. (٢) ڕێی قیرتاوکراو؛ ڕووی چیمەنتۆکراو. (٣) قیرتاو؛ چیمەنتۆو زیخ‌و ووردە بەرد.

**pavis** (pav′is), *n.* قەڵغانی هەموو لەش.

**pavonine** (pav′ə-nīn′, pav′ə-nin), *adj.* (١) وەك تاووس؛ تاووسی. (٢) ڕەنگین (وەك پەلکەڕەنگینە یا کلکی تاووس).

**paw** (pô), *n.* (١) چنگ؛ چنگی گیانداری چوارپێ (وەك سەگ‌و پشیلەو شێرو پڵنگ... هتد)؛ پێی چنگدار.

(٢) [Colloq.]، دەست (دەستێکی زل).

*v.t.* (١) چنگ لێدان؛ چنگ پیادان؛ ڕووشاندن بە چنگ.

(٢) سمکۆڵ کردن: *( to ~ the ground)*.

(٣) بە ناشرینانە ڕەفتار لەگەڵ نواندن؛ هەڵگلۆفتنەوە.

**paw** (pô), *n.* [Dial.], باوك.

**pawl** (pôl), *n.* گیرە.

**pawn** (pôn), *n.* (١) بارمتە؛ بارمتەی دانراو لەبری قەرز.

(٢) دەست بەسەر (کە وەك بارمتە گل دەدرێتەوە).

(٣) دانان بە بارمتە؛ کردن بە بارمتە.

*v.t.* (١) لە بارمتەدا دانان؛ خستنە ڕەهتەوە: *( to ~ jewelry)*.

(٢) خستنە مەترسییەوە؛ گرەو لەسەر کردن: *( He ~ed his honor.)*

**pawn** (pôn), *n.* (١) داش (شەترەنج، دامە)؛ سەرباز یا پیادەی شەترەنج؛ بێ نرخترین داش. (٢) دەسکەلا؛ کەسێکی ناگرنگە کە کەسانی تر بەکاری دەهێنن‌و یاری پێ دەکەن بۆ هێنانەدی مەبەستی تایبەتی خۆیان: *( We are only a ~ in the game of international politics.)*

**-pawner** *(n.)*: pawnor *(n.)*.

**pawnage** (pôn′ij), *n.* لە بارمتەدا دانان؛ کران بە بارمتە؛ بارمتەکاری.

**pawnbroker** (pôn′brō′kẽr), *n.* بارمتەگر؛ کەسێکە کە پارە دەدات بە قەرز بەرامبەر بە بارمتەیەك.

**pawnshop** (pôn′shop′), *n.* بارمتەخانە؛ دوکانی بارمتەگر.

**pawn ticket,** ڕەسیدی شتی بارمتەکراو.
**pawpaw** (pô′pô′), *n.* = papaw.
**pay** (pā), *v.t.* (١) پێدان؛ دان؛ مووچە پێدان؛ کرێ پێدان:
*( Most tenants ~ their rent on time.)*
(٢) دانەوە *( She paid kindness with evil.)*.
(٣) قەرزدانەوە. *( to ~ one's debts)*.
(٤) کردن (ئافەرین، ستایش)؛ پێشکەش کردن:
*( to ~ someone a compliment)*
(٥) سەرلێدان. *( Let us ~ him a visit.)*.
(٦) دان (قازانج) *( The bank ~s five percent interest.)*.
(٧) هێنان؛ بەسوود بوون: *( It will ~ you to read this book.)*.
*v.i.* (١) پێدان؛ دان؛ دانەوە
(٢) بەکەڵک بوون؛ هێنان؛ بەسوودبوون: *( It ~s to be honest.)*.
*n.* (١) پێدان؛ دان؛ پێدران (٢) مووچە؛ کرێ. (٣) پاداشت.
(٤) کەسێك لەڕووی سەرچەوتی و سەرڕاستییەوە لە قەرزدانەوەدا.
*adj.* (١) هی پێدان یا پێدران (مووچە، کرێ... هتد).
(٢) بەردی بەنرخی تێدایەو بەسوودە: *( ~ gravel)*
(٣) بە پارەیە؛ بە پارە ئیش دەکات. *( a ~ telephone)*.
**in the pay of,** بە کرێ گیراوە لەلایەن؛ مووچەی بۆ بڕاوەتەوە لەلایەن:
*( He is in the pay of the enemy.)*
**pay as you go,** پارەدان لەکاتی کڕیندا نەك پێشەکی یا بە قەرز.
**pay back,** دانەوە (پاداشت، قەرز؛ بۆ بژاردن.
**pay down,** (١) پارەی ڕەق دان.
(٢) پێشەکی هەندێکی دان و ئەوەی دەمێنێتەوە بە قەرز.
**pay for,** (١) سزا چەشتن بەهۆی؛ ئازار خواردن بەهۆی:
*( to pay for one's mistakes, sins, etc.)*
(٢) بۆ بژاردن
**pay off,** (١) دانەوەی قەرز بەتەواوی؛ هەموو مووچە یا کرێ پێدان لەکاتی دەرکردندا (٢) تۆڵە لێ سەندن. (٣) پاداشت دانەوە (بە چاك یا خراپ).
(٤) پێشی کەشتی وەرگێڕان بەرەو ئەو لایەی کە با بۆی هەڵدەکات.
(٥) [Colloq.]، بەرتیل پێدان.
**pay one's way,** بەشی خۆ دان لە خەرجی؛ منەتی کەس هەڵ نەگرتن.
**pay out,** (١) پارەدان؛ پارە خەرج کردن.
(٢) گوریس شل کردن (کەشتیوانی).
**pay up,** قەرزدانەوە بەتەواوی؛ هەموو قەرزەکە یا پارەکە دانەوە بە یەکجار.
**pay** (pā), *v.t.* داپۆشین بە قیر یا ماددەی تر بۆ ئاوبڕکردن (درزی کەشتی).
**payable** (pā′ə-b'l), *adj.* (١) دەتوانرێ بدرێتەوە (قەرز).
(٢) دەبێ بدرێتەوە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا. (٣) بەسوود (کانگا، بازرگانی).
**payday** (pā′dā′), *n.* ڕۆژی مووچە وەرگرتن یا دان؛ ڕۆژی مانگانە وەرگرتن یا دان.
**payee** (pā-ē′), *n.* پێدراو (پارە، قەرز، کومپیالە، بانقەنۆت).
**payer** (pā′ēr), *n.* بدەر (پارە، قەرز، کومپیالە، بانقەنۆت).
**payload** (pā′lōd′), *n.* (١) بارگەی کرێ؛ باری بە کرێ گوێزراوە.
(هەروەها دەیشنووسرێ: " **pay load** ").
(٢) (أ) باری فڕۆکە (بە ڕێبوارو بارەوە). (ب) تەقەمەنی سەری مووشەك.
(ج) کەرەسەی زانیاری کۆکردنەوەو گەیاندنی ئەستێرەی دەستکرد.
(د) کەرەسەی کەشتی هەوایی.
**paymaster** (pā′mas′tēr, pā′mäs′tēr), *n.* فەرمانبەری مووچەو کرێدەر
**payment** (pā′mənt), *n.* (١) دانەوە (قەرز)؛ دان؛ درانەوە:
*( to demand ~ of a debt)*
(٢) قیست؛ پارەی دراو (مانگانە): *( a low monthly ~ )*
(٣) پاداشت (بە چاك یا بە خراپ)؛ سزا؛ خەڵات؛ بۆ بژاردن.
**paynim** (pā′nim), *n.* (١) [Archaic]، **pagan**.
(٢) کەسێکی خاچ نەپەرست بەتایبەتی موسوڵمانێك.

**pay-off** (pā′ôf′), *n.* [Colloq.], (١) (أ) دان؛ پێدان (مووچە، کرێ)؛ دانەوە (قەرز). (ب) کاتی دانەوە یا پێدان. (٢) ڕێکەوتن (سەوداگەری).
(٣) دەسکەوتنێك یا دۆڕاندنێکی چاوەڕوان نەکراو. (٤) تۆڵە؛ سزا. (٥) بەرتیل
**payola** (pā-ō′lə), *n.* (١) بەرتیل دان. (٢) بەرتیل.
**payroll** (pā′rōl′), *n.* (١) لیستەی مووچەی مانگانە؛ لیستەی مووچە.
(٢) سەرجەمی مانگانەی دراو؛ سەرجەمی مووچەی دراو لە جارێکدا:
*( to meet a ~ )*
**pea** (pē), *n.* (١) پۆڵکە: ڕووەکێکی تەرز فرێدەرە بەرەکەی سەوزە لە نۆك دەچێ دەکرێ بە چێشت (٢) بەری ئەم ڕووەکە.
(٣) چەند ڕووەکێکی تری ئەم توخمە (وەك: نیسك و نۆك).
**as like as two peas,** دەقاودەق لەیەك دەچن؛ کتومت وەك یەك وان.
**peace** (pēs), *n.* (١) ئاشتی. (٢) پەیمانی ئاشتی.
(٣) ئاسایش. (٤) ئاسوودەیی: *( ~ of mind)*
(٥) سازین؛ پێکەوە گونجان. (٦) بێ دەنگی؛ هێمنی.
*v.i.* بێ دەنگ بە!؛ بێ دەنگ بوون.
**at peace,** (١) لە ئاشتیدایە؛ لە جەنگدا نییە؛ لە ناکۆکیدا نییە.
(٢) پڕ ئاسوودە؛ ئاسوودە؛ خامۆش.
**hold ( or keep ) one's peace,** بێ دەنگ بوون؛ قسە نەکردن؛ دەم داخستن.
**keep the peace,** ئاسایش ڕاگرتن؛ ئاسایش پاراستن؛ ڕێگە نەدان بە پشێوی و یاسا شکاندن.
**make one's peace with,** ئاشتبوونەوە لەگەڵ؛ ڕێکەوتنەوە لەگەڵ.
**make peace,** ڕێکەوتن؛ جەنگ دوایی پێ هێنان؛ ئاشتی خستنەوە؛ شەڕوشۆڕ بڕینەوە.
**peaceable** (pēs′ə-b'l), *adj.* (١) لاشەڕ؛ ئاشتیخواز.
(٢) ئاسوودە؛ پڕ ئاسوودە؛ بێ شەڕوشۆڕ.
-peaceably *(adv.)*.
**peace conference,** کۆنگرەی ئاشتی و شەڕوشۆڕ دوایی پێ هێنان؛ کۆڕی ئاشتی.
**peaceful** (pēs′fəl), *adj.* (١) ئاشتیخواز؛ لاشەڕ:
*( a ~ people, tribe, person, etc.)*
(٢) ئاسوودە؛ پڕ ئاسوودە؛ هێمن؛ خامۆش: *( a ~ town; a ~ evining)*
(٣) بەبێ شەڕوشۆڕ؛ لەڕێگەی ئاشتییەوە؛ بە ئاشتی:
*( a ~ settlement of the conflict)*
-peacefully *(adv.)*; peacefulness *(n.)*.
**peacemaker** (pēs′māk′ēr), *n.* ئاوبژیکەر؛ ئاشتکەرەوە.
**peace offering,** (١) قوربانی بۆ سوپاس کردنی خودا.
(٢) دیاری ئاشتی: دیارییەکە کە پێشکەش دەکرێ بە ناحەزێك لەپێناوی ئاشتی و ئاشتبوونەوەدا
**peace officer,** پۆلیس؛ باڵبازی ئاسایش.
**peace pipe,** = calumet.
**peacetime** (pēs′tīm′), *n.* کاتی ئاشتی؛ کاتی بێ شەڕوشۆڕ
*adj.* هی ئاشتی؛ تایبەتی بە کاتی ئاشتی.
**peach** (pēch), *n.* (١) دارقۆخ. (٢) قۆخ. (٣) ڕەنگی قۆخ؛ ڕەنگی پرتەقاڵیی زەرد (٤) [Slang]، کەسێکی جوان و باش؛ ڕووخۆش و خۆشەویست؛ شتێکی جوان.
*adj.* (١) قۆخی. (٢) ڕەنگ قۆخی؛ پرتەقاڵیی زەرد.
**peach** (pēch), *v.t. & v.i.* بۆ تێچاندن؛ جاسووسی بەسەرەوە کردن.
**peachy** (pē′chi), *adj.* (١) قۆخی (لەڕووی ڕەنگ و پێکهاتنەوە).
(٢) [Slang]، زۆر خۆش؛ نایاب؛ بێگەرد: *( We had a ~ time.)*
**peacock** (pē′kok′), *n.* (١) تاووس.
(٢) کەسێکی بە کەش وفش و لەخۆبایی.
*v.i.* خۆفشکردنەوە (وەك تاووس یا عەلەشیش)؛ بە قنج وقیتی ڕۆیشتن؛ خۆنوواندن.

-peacockish *(adj.)*; peacocky *(adj.)*.

**peacock blue,** شینی تاووسی؛ شینی سەوزکار.

**peafowl** (pē′foul′), *n.* تاووس؛ مێ تاووس

**pea green,** سەوزی پۆلکەیی؛ سەوزی کاڵی زەردباو.

**peahen** (pē′hen′), *n.* مێ تاووس

**peak** (pēk), *v.i.* لاوازبوون؛ پووکانەوە؛ سیس بوون.

**peak** (pēk), *n.* (١) قووتکە؛ قووچکە؛ تەوقەسەر؛ پۆپە؛

*( the ~ of a cap; the ~ of a roof)*

(٢) (ا) لووتکە؛ لووتکەشاخ؛ سەرلووتکە؛ سەرملە. (ب) شاخ؛ سەرشاخ.

(٣) تاف؛ گەرمە؛ ئەوپەڕ؛ هەرەت

*( at the ~ of his powers; the ~ of summer)*

*v.t.* گەیاندنە پەری ئەوپەڕ

*v.i.* گەیشتنە پەری ئەوپەڕ؛ گەیشتنە بەرزترین پلە.

*adj.* ئەوپەڕ؛ بەرزترین پلە: *( ~ efficiency)*.

**peaked** (pēkt, pēk′id), *adj.* لووت تیژ؛ لووتکەدار؛ قووچکەدار.

**peaked** (pēk′id), *adj.* لاواز؛ پووکاوە؛ سیس.

**peal** (pēl), *n.* (١) دەنگی زەنگ؛ دەنگی لێدانی چەند زەنگێک.

(٢) دەنگێکی گەورەی درێژخایەن (تەق‌وتووقی تفەنگ، تریقانەوە یا قاقای پێکەنین، هەورەگرمە... هتد)؛ دەنگی زرنگانەوە

*v.i. & v.t.* زرنگانەوە؛ دەنگدانەوە.

**peanut** (pē′nut′), *n.* (١) پووەکی بستەی سودانی (لە توخمی پۆلکەو نۆکە). (٢) بستەی سودانی؛ کەلووی بستەی سودانی

(٣) [Slang]. کەسێکی بچووک یا بێ بایەخ و هیچ‌وپووچ

(٤) *(pl.)*. [Slang]، هەندێک پارەی زۆر کەم؛ هەندێکی زۆر کەم؛ شتێکی کەم و بێ نرخ و هیچ‌وپووچ:

*( He bought the car for ~s.; He paid ~s for it.)*

**peanut butter,** کەرەی بستەی سودانی: بریتییە لە بستەی هاڕراوی وەک کەرە لێهاتوو کە لە نان هەڵدەسووریّ و دەخورێ.

**pear** (pâr), *n.* (١) دارهەرمێ. (٢) هەرمێ

**pearl** (pûrl), *n.* (١) مرواری. (٢) mother-of-pearl.

(٣) شتێکی جوان و بەنرخ و بچووک وەک مرواری.

(٤) ڕەنگی مرواری: ڕەنگی سپی زەردکار یا خۆڵەمێشی شینکار.

(٥) جۆرە چاپێکە

*v.t.* (١) ڕازاندنەوە بە مرواری. (٢) وەک مرواری لێکردن لە شێوە و ڕەنگدا.

*v.i.* ڕاوە مرواری کردن

*adj.* (١) تایبەتی بە مرواری؛ بە مرواری ڕازاوە؛ مرواریدار.

(٢) مرواری ئاسا؛ لە مرواری دەچێ لە شێوە یا ڕەنگدا

**cast pearls before swine,** پێشکەش کرـنی شتێکی جوان و خۆش و نایاب بە کەسێک کە نرخی نەزانێ.

**pearl barley,** جۆساوەر

**pearl diver ( or fisher ),** مرواریگر؛ ڕاوکەری مرواری.

**pearl gray,** خۆڵەمێشیی کاڵی شینکار.

**pearl millet,** گاڵ؛ هەرزن

**pearly** (pûr′li), *adj.* (١) لە مرواری دەچێ لە شێوە و ڕەنگدا؛ مرواری ئاسا *( ~ teeth)* (٢) مروارێدار؛ بە مرواری ڕازاوە.

**pearmain** (pâr′mān), *n.* جۆرە سێوێکە

**peart** (pērt, pûrt), *adj.* [Dial.]. (١) کەیف خۆش؛ قنج‌وقیت. (٢) زۆرزان؛ زیرەک

**peasant** (pez′'nt), *n.* (١) جووتیار؛ ڕەنجبەر؛ وەرزێر؛ مسکێن

(٢) لادێیی. (٣) کەسێکی کێوی هیچ نەزانی کەرتر

**peasantry** (pez′'n-tri), *n.* (١) جووتیاران؛ ڕەنجبەران؛ وەرزێران. (٢) باری ژیان و پلەوپایەی جووتیار.

**peascod, peasecod** (pēz′kod′), *n.* کەلووە پۆلکە

**pease** (pēz), *n.* (١) [Obs.]. pea. (٢) plural of pea.

**pea soup,** (١) شۆرباى نیسک. (٢) [Slang]، تەمێکی چڕی زەردباو.

**peat** (pēt), *n.* پاشماوەی ڕووەکی ڕزیوی ناو زەلکاو (بۆ سووتەمەنی و زەوی داپۆشین و پەین بەکاردەهێنرێ).

**peat moss,** (١) جۆرە قەوزەیەکی شوێنی زۆر تەڕە. (٢) ئەم جۆرە قەوزەیە بە ڕزیوی (وەک پەین بەکاردەهێنرێ).

**pebble** (peb′'l), *n.* (١) چەو؛ زیخ؛ وورده بەرد.

(٢) (ا) بەردی کوارتز: بەردێکی بلووری ڕوون و بێ ڕەنگە. (ب) چاویلکە یا گەردبینی لەم بلوورە درووستکراو.

(٣) ڕوویەکی زبری چرچ‌ولۆچاوی دەستکردە (وەک هی قایش و کاغەز).

*v.t.* (١) چەوریژکردن. (٢) زبرکردنی ڕووی قایش و کاغەز.

-pebbly *(adj.)*.

**pecan** (pi-kan′, pi-kän′, pē′kan), *n.* (١) گوێزی ئەمەریکی: شێوەکەی هێلکەیی‌یە و توێکڵەکەی تەنک و ڕەنگەکەی و تامەکەی وەک گوێزە (٢) دارگوێزی ئەمەریکی.

**peccable** (pek′ə-b'l), *adj.* بۆی هەیە گوناه یا هەڵە بکات؛ لە گوناه بەدوور نییە.

-peccability *(n.)*.

**peccadillo** (pek′ə-dil′ō), *n.* گوناهێکی بچووک؛ هەڵەیەکی بچووک؛ هەڵە.

**peccancy** (pek′ən-si), *n.* (١) گوناهباری؛ تاوانباری. (٢) گوناه.

**peccant** (pek′ənt), *adj.* (١) گوناهبار؛ گوناهکار. (٢) سنوورشکێن؛ پەیڕەوی نەکەر؛ کاری ناشرینکەر. (٣) دەبێتە هۆی نەخۆشی.

**peccary** (pek′ə-ri), *n.* گیاندارێکی ئەمەریکی‌یە لە بەراز دەچێ.

**peck** (pek), *v.t.* (١) دەنووک لێدان؛ دانە بەر دەنووک.

(٢) کون تێکردن؛ تێکردن: *( The bird ~ed a hole in the bread.)*

(٣) چینەکردن؛ بە دەنووک هەڵگرتن.

*v.i.* پیادان (وەک بە دەنووک یا شتێکی نووک تیژ).

*n.* (١) دەنووک لێدانێک؛ لێدان.

(٢) شوێن دەنووک؛ نیشانەی دەنووک لێدان.

(٣) [Colloq.]، ماچێکی خێرای وەک دەنووک لێدان.

**peck at,** (١) پیادان (وەک بە دەنووک یا شتی نووک تیژ؛ دەنووک لێدان. (٢) [Colloq.]، بە قێزوبێزەوە خواردن؛ چینە تێدا کردن؛ بەناستەم لێ خواردن. (٣) [Colloq.]، هەمیشە ڕەخنەلێگرتن.

**peck** (pek), *n.* (١) پێوانەیەکی دەغڵ‌ودانە بریتی‌یە لە چواریەکی " بوشل " یەک، واتە دوو گاڵۆن. (٢) دەفرێکی یەک پێکی. (٣) [Colloq.]، برێکی زۆر (ناخۆشی، سەرئێشە).

**pecker** (pek′ēr), *n.* (١) دارکونکەرە؛ باڵندە یا شتی دەنووک لێدەر. (٢) قولنگە؛ پاچ. (٣) [British Slang]، غیرەت؛ ئازایی. (٤) [Vulgar]، کێر.

**pecking order,** گەورەو بچووکی: پێکهاتنی کۆمەڵگای مرۆڤ و باڵندەو گیاندار بەپێی گەورەو بچووکی و پلەوپایە (کە ئەویش دەکەوێتە سەر دڕی و بەدەسەلاتی و پارەداری... هتد).

**pecten** (pek′tən), *n.* پەردەیەکی شانەیی‌یە بەدەوری چاوی باڵندە و گیاندارە خشۆکەکاندا.

**pectin** (pek′tin), *n.* پەکتین: ماددەیەکی لیقنە لە میوەدا هەیە وەک سێو بۆ دەق پێگرتنی مرەباو نەرمەلیقەو دەرمان و ئارایشت بەکاردەهێنرێ

**pectoral** (pek′tə-rəl), *adj.* (١) سنگی؛ سینەیی؛ تایبەتی بە سنگ. (٢) بۆ نەخۆشی سی و سنگ بەکەڵکە. (٣) دەکرێ بە سنگەوە: *( a ~ cross)* (٤) دەروونی؛ هی هەست و دەروون.

*n.* (١) ئەندام یا ماسولکەی سنگ. (٢) پەڕەکەی سنگی. (٣) دەرمانی سنگ. (٤) سینەبەند؛ شتێکە دەکرێ بە سنگەوە بۆ جوانی.

**pectoral arch (or girdle),** پشتێنی سینەیی (لە بڕبڕەدارەکاندا)، (لە مرۆڤیشدا پێی دەوترێ: " shoulder girdle ").

**pectoral cross,** خاچی سینەیی (کە سەرەک قەشە دەیکات بە سنگییەوە).

**pectoral fin,** پەڕەکەی سینەیی ماسی.

**peculate** (pek′yoo-lāt′), *v.t. & v.i.* پارە لرف لێدان؛ دزینی پارەو شتی پێ سپێردراو.
-peculation *(n.)*; peculator *(n.)*.
**peculiar** (pi-kūl′yēr), *adj.* (١) تایبەتی بە (کەسێك، شتێك، شوێنێك، گەلێك... هتد)؛ جیاکەرەوە: *( a custom ~ to Americans)* . (٢) تایبەتی: *( a ~ talent for distorting the truth)* . (٣) سەیر؛ نائاسا: *( a ~ man; ~ habits, actions, etc.)* .
*n.* (١) شتێکی تایبەتی بە کەسێك (ماف). (٢) کڵێسەیەکی تایبەتی (کە بەشێك نەبێ لە کڵێسەکانی ئەو ناوچەیەی کە خۆی تێدایە، بەڵکو بەشێك بێ لە کڵێسەی ناوچەیەکی تر).
-peculiarly *(adv.)*.
**peculiarity** (pi-kū′li-ar′ə-ti, pi-kūl′yar′ə-ti), *n.* (١) شتێکی تایبەت بە خۆ؛ تایبەخو (٢) تایبەتێتی. (٣) شتێکی سەیر یا نائاسا؛ خوویەك یا تایبەخۆیەکی سەیر: *( ~ies of speech, dress, habit, etc.)* .
**pecuniary** (pi-kū′ni-er′i), *adj.* (١) دارایی؛ پارەیی؛ پارە: *( ~ considerations; a ~ loss, reward, etc.)* (٢) تایبەتی بە سزای پارە: *( a ~ offense)*
**-ped, -pede** (ped), پاشگرێکە بەمانای: پێ؛ قاچ.
**pedagogic** (ped′ə-goj′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە مامۆستاو پیشەی مامۆستایەتی. (٢) تایبەتی بە زیاد لە پێویست بایەخ دانی مامۆستا بە فێربوونی شتی هیچ‌وپووچ‌و وورد.
-pedagogical *(adj.)*; pedagogically *(adv.)*.
**pedagogics** (ped′ə-goj′iks), *n.pl.* = pedagogy.
**pedagogue** (ped′ə-gog′, ped′ə-gôg′), *n.* (١) مامۆستا (هەندێ جار لەرووی سووکییەوە لەبەر زۆر گوێدان بە شتی هیچ‌وپووچ). (٢) مامۆستایەکی ووشك کە زۆر بایەخ دەدات بە شتی ناو کتێب‌و وورد‌و هیچ‌وپووچ
-pedagoguish *(adj.)*.
**pedagogy** (ped′ə-gō′ji, ped′ə-goj′i), *n.* (١) مامۆستایەتی؛ مامۆستایی؛ پیشەی مامۆستایەتی. (٢) فێرکاری؛ هونەری پەروەردەو فێرکردن (بەتایبەتی ئامادەکردنی قوتابی بۆ مامۆستایەتی).
**pedal** (ped′'l), *adj.* (١) هی پێ (٢) بە پایدەر لێ دەخوڕێت؛ بە پایدەر ئیش دەکات.
*n.* پایدەر (پاسکیل، پیانۆ، مەکینەی جل دوورین).
*v.t. & v.i.* (١) پایدەرلێدان. (٢) پاسکیل لێخوڕین.
**pedant** (ped′'nt), *n.* (١) مامۆستایەکی مێشك تەسك کە زۆر بایەخ دەدات بە فێربوونی شتی وورد‌و هیچ‌وپووچ‌و لەبەرکردنی کوێرانەی پەیڕەو. (٢) کەسێکە کە هەر شتی ناو کتێب بزانێ‌و گوێ نەداتە شتی کردەنی. (٣) زانای خۆدەرخەر. (٤) [Obs.] مامۆستا.
**pedantic** (pi-dan′tik), *adj.* زۆر بایەخدەر بە فێربوونی قوتابی بۆ شتی وورد‌و هیچ‌وپووچ؛ ووشك‌و مێشك تەسك (مامۆستا)؛ هەر شارەزای شتی ناو کتێبە.
-pedantically *(adv.)*.
**pedantry** (ped′'n-tri), *n.* (١) زۆر بایەخدانی مامۆستا بە فێربوونی شتی وورد‌و هیچ‌وپووچ؛ مێشك تەسکی مامۆستا. (٢) خۆبادان بە پلەی زانیاری‌و شارەزایی خۆوە. (٣) نموونەی کردەوەیەکی یەکێك لەم دوو جۆرە کەسەی سەرەوە.
**pedate** (ped′āt), *adj.* (١) پێدار؛ قاچدار. (٢) نە پێ دەچێ؛ قاچ ئاسا؛ وەك پێ کاردەکات: *( ~ appendages)* . (٣) باوەشێنی (گەڵا)؛ بەش بەش: *( a ~ leaf)* .
**peddle** (ped′'l), *v.i.* (١) دەستگێری کردن؛ چەرچێتی کردن؛ گەڕان بە کۆڵانان‌دا بۆ شت فرۆشتن. (٢) خۆ خەریك کردن بە شتی هیچ‌وپووچەوە.
*v.t.* (١) دەستگێری کردن؛ چەرچێتی کردن؛ شت فرۆشتن ماڵ بە ماڵ *( ~ing goods from door to door)* (٢) نەختە نەختە فرۆشتن یا بڵاوکردنەوە (بەنگ، بیروباوەڕ، قسەی پاش ملە): *( ~ing drugs, an idea, etc.)*
**peddler, pedlar** (ped′lēr), *n.* دەستگێڕ؛ چەرچی.
**peddlery, pedlary** (ped′lēr-i), *n.* (١) دەستگێری؛ چەرچێتی. (٢) فرۆتەنی دەستگێڕ.
**peddling** (ped′liŋ), *adj.* بە شتی هیچ‌وپووچەوە خەریك؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ.
**-pede, -ped** (pēd), پاشگرێکە بەمانای: پێ؛ قاچ.
**pederast** (ped′ə-rast′, pē′də-rast′), *n.* هەتیوباز؛ نێرباز.
**pederasty** (ped′ə-ras′ti, pē′də-ras′ti), *n.* هەتیوبازی؛ نێربازی.
**pedestal** (ped′is-t'l), *n.* (١) بنکە (بۆ پەیکەر یا گوڵدان لەسەر دانان)؛ بن (پایە، کۆڵەکە). (٢) بناغە.
*v.t.* خستنە سەر بنکە؛ خستنە سەر پاڵپشت.
**put ( or set ) on a pedestal,** پەرستن؛ وەك بت پەرستن؛ شکۆپێدان لە ئەندازە بەدەر.
**pedestrian** (pə-des′tri-ən), *adj.* (١) پیادە: *( ~ traffic)* . (٢) ڕەشۆکی؛ بازاڕی؛ ووشك‌و ناخۆش (ویژە)؛ هیچ نەزان؛ سادە: *( a ~ literary style)*
*n.* پیادە؛ کەسێکی پیادە.
**pedestrianism** (pə-des′tri-ən-iz'm), *n.* (١) بە پێ گەڕان (بۆ تەندرووستی)؛ پیادەیی؛ بە پێ ڕۆیشتن. (٢) ڕەشۆکێتی؛ بازاڕێتی؛ نەزانی؛ ووشکی‌و ناخۆشی؛ بێ تامی.
**pedi-** (ped′i), پێشگرێکە بەمانای: پێ؛ قاچ: *(pedicure)* .
**pediatric** (pē′di-at′rik, ped′i-at′rik), *adj.* تایبەتی بە پزیشکەوانی منداڵان.
**pediatrician** (pē′di-ə-trish′ən), *n.* پزیشکی منداڵان؛ پسپۆڕی نەخۆشی منداڵان.
**pediatrics** (pe′di-at′riks, ped′i-at′riks), *n.pl.* پزیشکەوانی منداڵان.
**pediatrist** (pē′di-at′rist, ped′i-at′rist), *n.* = pediatrician.
**pedicel** (ped′i-s'l), *n.* (١) قەدە بچکۆلە. (٢) ئەندامی ڕاگر (زیندەوەرزانی).
**pedicle** (ped′i-k'l), *n.* = pedicel.
**pedicular** (pi-dik′yoo-lēr), *adj.* (١) ئەسپێیی؛ هی ئەسپێ. (٢) ئەسپێ وون؛ ئەسپێ تێی داوە.
**pediculous** (pi-dik′yoo-ləs), *adj.* ئەسپێ تێی داوە
**pedicure** (ped′i-kyoor′), *n.* (١) پزیشکی پێ. (٢) قاچ چاکردنەوە. (٣) نینۆکی قاچ کردن‌و بریەنکردنی.
**pedigree** (ped′ə-grē′), *n.* (١) بنەچە؛ ڕەگەز؛ ڕەچەڵەك. (٢) بنەچەی گیاندارێکی ڕەسەن (ئەسپ، سەگ... هتد)؛ ڕەسەننامەی گیاندارێك
**pedigreed** (ped′ə-grēd′), *adj.* ڕەسەن (بەتایبەتی سەگ‌و ئەسپ): *( a ~ dog)*
**pediment** (ped′ə-mənt), *n.* (١) ڕووی سێگۆشەیی لاسەربان (خانووسازی یۆنانی‌و ڕۆژاوایی). (٢) ڕوویەکی سێگۆشەیی ڕازێنەرەوە بەسەر دەرگا یا ناگردانەوە.
**pedlar** (ped′lēr), *n.* = peddler.
**pedo-, ped-** (pē′dō, pē′də), پێشگرێکە بەمانای: منداڵ؛ بەچە.
**pedodontia** (pē′də-don′shə), *n.* دانسازی منداڵ.
**pedology** (pi-dol′ə-ji), *n.* زانستی ڕەووشت‌و پەروەردەکردنی منداڵ.
-pedological *(adj.)*; pedologist *(n.)*.
**pedometer** (pi-dom′ə-tēr), *n.* هەنگاوژمێر؛ ئامێرێکە بۆ پێوانی ئەو ڕێگەیەی بە پێ دەبڕێت.
**peduncle** (pi-duŋ′k'l), *n.* (١) لاسکە گوڵ؛ لاسکە هێشوو؛ قەف. (٢) ڕیشاڵی هەستەدەماری مێشك. (٣) ئەندامێکی لاسکی یا قەفی زیندەوەری

بڕبڕەدار.

-peduncular *(adj.)*.

**peduncuIate** (pi-duŋʹkyoo-lit, pi-duŋʹkyoo-lāt´), *adj.*
*Also* peduncuIated, قەفدار؛ لاسکدار

**peck** (pēk), *v.i.* سەرەتاتکێ کردن: بە گورج و دزییەوە سەیرکردن:
*( to ~ at something)*
*n.* سەرەتاتکێ *( to take a ~ at)* .

**peekaboo** (pēkʹə-boo´), *n.* چاوشارکێ: یارییەکی منداڵانەیە بریتییە لە بە دەست دەموچاوی خۆ داپۆشین و لەپڕ هەڵماڵینی و هاوارکردنی " پیکابوو

**peel** (pēl), *v.t.* توێکڵ لێکردنەوە: پاککردن؛ داماڵین:
*( to ~ an orange)*
*v.i.* (١) توێك فڕێدان؛ توێخ لێبوونەوە؛ توێکڵ داماڵران
(٢) [Slang]. خۆ ڕووتکردنەوە.
*n.* توێکڵ؛ توێك؛ توێخ.
**peel off,** خۆ دابڕینی فڕۆکەیەك لە پۆلەکەی بۆ بۆردوومانکردن یا نیشتنەوە

**peel** (pēl), *n.* قوللە (بەتایبەتی وەك یەکێك لەوانەی لەسەر سنووری نوسکوتلەندەو ئینگلتەرە لە سەدەی شانزەدا دروستکراوە)؛ قەڵا

**peeling** (pēlʹiŋ), *n.* توێکڵ؛ توێك؛ توێخ.

**peen** (pēn), *n.* سەرە تیژەکەی چەکوش

**peep** (pēp), *v.i.* (١) جریکەکردن (بەچکە باڵندە)؛ جریواندن؛ جریوەکردن.
(٢) زیقەزیق کردن (وەك منداڵ)؛ چرکەکردن؛ جیقەکردن.
*n.* (١) جریکە؛ جریکەجریك؛ جریوە.
(٢) زیقەزیق؛ چرکە؛ دەنگی بچووکی سکاڵا:
*( I don't want to hear a ~ out of you.)*

**peep** (pēp), *v.i.* (١) لە کونێکەوە سەیرکردن:
*( to ~ through the keyhole)*
(٢) بە دزییەوەو بە پەلە سەیرکردن؛ سەرەتاتکێ کردن:
*( He ~ed at her across the room.)*
(٣) سەردەرهێنان؛ بەرەبەرە یا نەختێك سەردەرخستن:
*( Stars ~ed through the clouds.)*
*v.t.* سەر پێ دەرهێنان؛ سەر پێ دەرپەڕاندن.
*n.* (١) سەرەتاتکێ؛ سەیرکردنێکی بە پەلەو بە دزییەوە.
(٢) کونی لێوە سەیرکردن (٣) هەڵاتن (ڕۆژ، بەرەبەیان)؛ یەکەم دەرکەوتن.

**peeper** (pēpʹẽr), *n.* (١) لە کونەوەو بە نیمچە دزییەوە سەیرکەر (بەتایبەتی کەسێك کە چێژ لەوە وەربگرێ کە بە دزییەوە سەیری دەستبازیی و کێرو قوزو جووت بوونی خەڵك بکات) (٢) [Slang]. چاو.

**peeper** (pēpʹẽr), *n.* (١) بۆق (٢) کەسێك یا گیاندارێکی زیقەزیقکەر

**peephole** (pēpʹhōl´), *n.* کونە ڕۆشنە؛ کونی دەرگا (بۆ لێوە سەیرکردن)؛ کونی بە دزییەوە لێوە سەیرکردن.

**Peeping Tom,** کەسێکە کە چێژ لەوە وەردەگرێ بە دزییەوە سەیری کێرو قوزو جووت بوونی خەڵك بکات.

**peep show,** سنووقێکە چەند وێنەیەك یا شتی تری تیایەو کونێکیشی تیایە بە گەردێنەوە بۆ لێوە سەیرکردنی وێنەکانی ناوی

**peep sight,** نیشانگای تفەنگ و دەمانچە.

**peer** (pêr), *n.* (١) کەسێکی هاوپلە؛ هاوتا (پلە، تەمەن، گرنگی، بەرامبەر بە یاسا)؛ حەریف (٢) بەگزادەی ئینگلیزی
(٣) [Archaic]. هەڤاڵ؛ ناوەل
*v.t.* (١) هاوپلەکردن؛ هاوتاکردن (٢) بە بەگزادەکردن.
**peer of the realm,** ئەندامێکی چینی بەگزادەی ئینگلیزی کە بە هۆی بنەچەکەیەوە مافی ئەندامێتی هەیە لە ئەنجوومەنی لۆردانی پەرلەماندا.

**peer** (pêr), *v.i.* (١) بە ووردی سەیرکردن؛ باش لێ ووردبوونەوە؛ باش تێڕوانین *( to ~ into a dark cave)*
(٢) سەردەرهێنان؛ هەڵاتن؛ نەختێك دەرکەوتن
*( The moon ~ed from behind a cloud.)*

**peerage** (pêrʹij), *n.* (١) چینی بەگزادەی وڵاتێك.
(٢) پلەوپایەی بەگزادە؛ بەگزادەیی.
(٣) بەگزادەنامە؛ کتێبێکە بە ناوو بنەچەی بەگزادەکانەوە.

**peeress** (pêrʹis), *n.* (١) ژنە بەگزادە. (٢) بانوو بەگزادە.

**peerless** (pêrʹlis), *adj.* بێ هاوتا؛ بێ وێنە.

**peeve** (pēv), *v.t.* پەستکردن؛ تووڕەکردن؛ زویرکردن.
*n.* (١) سکاڵا: *( a pet ~ )* .
(٢) پەستی؛ تووڕەیی؛ زویری؛ پیش خواردنەوە: *( to be in a ~ )*

**peeved** (pēvd), *adj.* پەست؛ تووڕە؛ زویر؛ تۆراو؛ قین هەڵساو.

**peevish** (pēvʹish), *adj.* (١) بە سکاڵا؛ زۆر بە سکاڵا
(٢) تووڕەوتڕۆ؛ تەنگەجیکڵانە؛ قیناوی.
-peevishly *(adv.)*; peevishness *(n.)*.

**peewee** (pēʹwē´), *n.* کەسێك یا شتێکی ئێجگار بچووك.

**peg** (peg), *n.* (١) سنگ؛ مێخ؛ چوقوڵ. (٢) دەمەوانە؛ تۆپەوانە.
(٣) دوگمەی توندکردنەوەو ڕاگرتنی ژێی کەمانچەو عوود
(٤) ماوەی نێوان دوو سنگ. (٥) پلە؛ نمرە. (٦) قولاپ.
(٧) [Colloq.]، پێ؛ قاچ؛ لاق؛ بنکە. (٨) [Colloq.]، ددان.
(٩) [British]، خواردنەوەی کحول بەتایبەتی براندی.
*v.t.* (١) داخستن بە دەمەوانە یا تۆپەوانە.
(٢) سنگ داکوتان؛ مێخ داکوتان؛ سنگ لێدان.
(٣) نیشانەکردن بە سنگ؛ پلە دیاریکردن بە مێخ. (٤) قولاپ لێدان.
(٥) نرخ چەسپاندن (پارەبازی). (٦) [Colloq.]، هاویشتن (تۆپ)؛ هەڵدان
*v.i.* (١) کۆشش کردن؛ هەمیشە هەوڵدان و خەریك بوون.
(٢) ڕاگرتن یا تۆمارکردنی سەرجەمی خاڵی براوە (یاری).
**round peg in a square hole,** کەسێکی نەگونجاو بۆ ئەو شوێن و بارو ئیشەی تێیدایە. (هەروەها " a square peg in a round hole " ).
**take down a peg,** پلەیەك هێنانە خوارەوە؛ فیز شکاندن؛ لە پلە کەمکردنەوە.

**Pegasus** (pegʹə-səs), *n.* (١) ئەسپی باڵدار کە بە سمکۆڵێك کانیاوی بانووخوای هۆنراوەی هەڵقوڵان (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) ئیلهامی هۆنراوەیی.
(٣) ناوی کۆنەستێرەیەکی باکوورییە.

**peg leg,** [Colloq.], (١) لاقی دارین؛ لاقی تەختە.
(٢) کەسێکە بە لاقێکی دارینەوە.

**pegmatite** (pegʹmə-tīt´), *n.* بەردێکی ناگرپژێنی زبری گرانیتییە.

**peg-top** (pegʹtop´), *adj.* هەرمێیی یا مزراحی (بەتایبەتی پانتۆڵێك کە لە سەرەوە دەڵب بێ و دەرەلنگەکانی تەسك بێ).

**peg top,** (١) مزراح. (٢) پانتۆڵی لە سەرەوە دەڵب و دەرەلنگ تەسك.

**peignoir** (pān-wärʹ, pānʹwär), *n.* = **negligee.**

**pejoration** (pē´jə-rāʹshən, pej´ə-rāʹshən), *n.* (١) دانە دواوە؛ بەناخداچوون؛ بەرەو خراپی چوون. (٢) گۆڕینی مانای ووشە بەرەو خراپی لە ماوەی چەند چەرخێکدا (زمانەوانی).

**pejorative** (pēʹjə-rā´tiv, pi-jôrʹə-tiv), *adj.* سووك و ناشرین (ووشە)؛ لە ڕێز کەمکەرەوە (ووشە): *( a ~ term)*
*n.* ووشەی سووك و ناشرین (کە بە کەسێك، کۆمەڵێك، یا ڕەگەزێك بووترێ).

**pekan** (pekʹən), *n.* (١) گیاندارێکی شیردەری ئەمەریکای باکوورە لە توخمی دەڵەك. (٢) کەوڵی ئەم گیاندارە.

**Pekingese** (pē´kiŋ-ēzʹ), *n.* (١) هاووڵاتییەکی پەکین.
(٢) شێوەزمانی پەکین. (٣) سەگێکی بچووکی تووك درێژو ئاوریشمەیی چاو دەرپۆقیوە.

**pekoe** (pēʹkō; Brit. pekʹō), *n.* پیکۆ: جۆرە چایەکی ڕەشە.

**pelage** (pelʹij), *n.* تووك یا کەوڵی گیانداری شیردەر.

**pelagic** (pə-lajʹik), *adj.* زەریایی؛ ئۆقیانووسی.

**pelargonium** (pel´är-gōʹni-əm), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکن لە توخمی ساردۆنیا.

**pelerine** (pel´ə-rēn′), *n.* بەرگێکی پالتۆیی بێ قۆڵی دەڵبی ژنانەیە.
**pelf** (pelf), *n.* (١) [Rare]، تالانی.
(٢) سامان؛ سامانی گلاو؛ ماڵی دنیا.
**pelican** (pel′i-kən), *n.* باڵندەیەکی ئاویی گەورەی دەنووک پان و درێژە توورەکەیەک لەژێر ملیدایە بۆ ماسی تێکردن و خواردنی.
**pelisse** (pə-lēs′), *n.* پالتۆی فەروەی درێژی ژنانەیە.
**pelite** (pē′līt), *n.* بەردی کلێن.
**pellagra** (pə-lā′grə, pə-lag′rə), *n.* نەخۆشییەکی درێژخایەنە نیشانەکانی زبری پێست و سک ئێشە و دەمارتوندییە.
**pellet** (pel′it), *n.* (١) کولۆ: حەبی دەرمان؛ تۆپەڵ؛ خڕۆک؛ دەنک.
(٢) گوللەتۆپی کۆن. (٣) گوللە؛ فیشەک. (٤) ساچمە.
*v.t.* (١) تۆپەڵکردن؛ خڕهەڵدان (٢) گوللە یا ساچمە تێگرتن.
**pellicle** (pel′i-k'l), *n.* پێستی تەنک؛ پەردەی تەنک؛ توێژ.
**pellitory** (pel′ə-tôr´i, pel′ə-tō´ri), *n.* ڕووەکێکی پزیشکیی هەڵگەڕاوە
**pell-mell, pellmell** (pel′mel´), *adv.* (١) بە شێواوی؛ بە پەرش وبڵاوی؛ بە تێکەڵ وپێکەڵی (٢) بە پەلەپڕووزێ؛ بە شپرزەیی.
*adj.* (١) شێواو؛ پەرش وبڵاو؛ تێکەڵ وپێکەڵ. (٢) بە پەلەپڕووزێ؛ بە شپرزە.
*n.* شێواوی؛ پەرش وبڵاوی؛ تێکەڵ وپێکەڵی.
**pellucid** (pə-lōō′sid), *adj.* (١) ڕوون؛ ڕۆشن؛ دیار.
(٢) ئاسان؛ ڕوون (باس): *( a ~ explanation)* .
**-pellucidity** *(n.).*
**pelota** (pe-lō′tə), *n.* جۆرە یارییەکی تۆپە
**pelt** (pelt), *v.t.* (١) پیاماڵین پەیتاپەیتا؛ پیادان؛ بەردەباران کردن؛ گوللەباران کردن: *( to ~ someone with snowballs, eggs, etc.)* .
(٢) کوتانەوە. (٣) فڕێدان؛ هاویشتن.
*v.i.* (١) کوتانەوە: *( The rain is ~ing down.)* .
(٢) خێرا ڕاکردن؛ خێرا ڕۆیشتن؛ بە پەلە ڕۆیشتن.
*n.* (١) پیاماڵین؛ پیاکێشان؛ لێدان؛ زللە؛ شەپازلە.
(٢) خێرایی؛ گوڕ *( running at full ~ )* .
**pelt** (pelt), *n.* (١) (ا) پێستە (بەتایبەتی بە تووکەکەیەوە).
(ب) پێستەی ئامادەکراو بۆ خۆشکردن. (٢) کەوڵ؛ فەروە.
(٣) پێستی مرۆڤ
**peltate** (pel′tāt), *adj.* قەڵغانی (گەڵا)؛ لاسکەکەی بە ناوەڕاستەکەیە- وەیەتی نەک بە قنگەکەیەوە: *( a ~ leaf)*
**pelting** (pel′tiŋ), *adj.* [Archaic], هیچ وپووچ؛ بێ بایەخ؛ بێ نرخ؛ پارەپیس؛ پیس وبۆگەن؛ خوێڕی.
**peltry** (pel′tri), *n.* پێستەی خۆش نەکراو
**pelvic** (pel′vik), *adj.* سمتەجۆڵەیی؛ هی سێبەندە.
**pelvis** (pel′vis), *n.* سمتەجۆڵە؛ سێبەندە.
**pemmican, pemican** (pem′i-kən), *n.* خواردەمەنییەکی هیندییە ئەمەریکاییەکانە بریتییە لە گۆشتی کوتراوی ووشک کراوەی تێکەڵاوی ڕۆن کراو و هەڵگیراو
**pemphigus** (pem′fi-gəs, pem-fī′gəs), *n.* نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی بڵق کردنی پێست
**pen** (pen), *n.* (١) پەچە؛ کۆز؛ گەوڕ؛ مۆڵگە؛ کولانە.
(٢) ئاژەڵی ناو پەچە یا گەوڕ؛ ئاژەڵی مۆڵ خواردوو.
(٣) شوێنێکی بچووکی چواردەور گیراو (وەک یاریگای منداڵی کۆرپە).
(٤) ئەنگەرگای چاککردنەوەی پاپۆڕی ژێرئاو.
*v.t.* کردنە پەچەوە؛ کردنە کۆزەوە.
**pen** (pen), *n.* (١) پێنووس؛ خامە؛ پاندان؛ قەڵەم
(٢) نووکی پاندان یا پێنووس. (٣) (ا) نووسین؛ شێوازی نووسینی وێژەیی.
(ب) پیشەی نووسین؛ نووسەری (ج) نووسەر.
(٤) [Archaic]، پەڕ؛ قەفی پەڕ.
(٥) قاوغی وەک پەڕی ناوەوەی هەندێ گیانداری دەریایی.

*v.t.* نووسین: *( to ~ a letter)* .
**pen** (pen), *n.* [Slang], بەندیخانە.
**penal** (pē′n'l), *adj.* (١) سزایی؛ تایبەتی بە سزا؛ بە سزا دادەنرێ.
(٢) سزا دەبڕێتەوە؛ سزایی: *( ~ laws; the ~ code)* .
(٣) سزای لەسەرە؛ دەبێتە هۆی سزادان: *( a ~ offense)*
(٤) هی سزادانە؛ سزایی؛ بۆ سزادان کراوە: *( a ~ colony)* .
**penal code,** یاسای سزایی: بریتییە لە سەرجەمی یاسای دەربارە بە جۆرەها تاوان و ئەو سزایەی بۆیان بڕاوەتەوە.
**penalize** (pē′n'l-īz´, pen′'l-īz´), *v.t.* (١) بە تاوان دانان: *( to ~ drinking liquor)*
(٢) سزادان.
**-penalization** *(n.).*
**penal servitude,** خستنە بەندیخانەوە و بێگار یا ئیشی گران پێ کردن.
**penalty** (pen′'l-ti), *n.* (١) سزا (٢) سزای پارە.
(٣) سزای یاریکەر (لەبەر لەسەر پەیڕەوی نەڕۆیشتن لەکاتی یاریدا)
**penance** (pen′əns), *n.* تۆبە؛ تۆبەکردن؛ تۆبەکاری؛ سزای تۆبەکاری؛ پەشیمان بوونەوە و سزای خۆ وەرگرتن.
*v.t.* تۆبە پێکردن.
do penance, تۆبەکردن.
**penates** (pi-nā′tēz), *n.pl.* خوداکانی ناوماڵی ڕۆمانەکانی کۆن.
**pence** (pens), *n.* [British], *plural of* **penny.**
(هەروەها لە ووشەی لێکدراودا بەکاردێت وەک " **twopence** " )
**penchant** (pen′chənt), *n.* ئارەزووی بەتین؛ حەز؛ بەدڵ بوون.
**pencil** (pen′s'l), *n.* (١) فلچەی هونەرمەند
(٢) شێوازی نیگارکێشی و لێهاتوویی هونەرمەندێک. (٣) پێنووس؛ خامە
(٤) میلی کلکاری: *( an eyebrow ~ )* .
(٥) (ا) کۆمەڵە تیشکی لە یەک خاڵدا بەیەکگەیشتوو (بینەواری).
(ب) وێنەی پێکهاتوو لە کۆمەڵە هێڵێکی لە یەک خاڵدا بەیەککەیشتوو (ئەندازە).
*v.t.* (١) نووسین؛ وێنەکێشان. (٢) پێنووس خستنە سەر.
**pencil sharpener,** قەڵەمدان؛ قەڵەمدادەر.
**pend** (pend), *v.i.* (١) چاوەڕێی بڕیارکردن.
(٢) [Dial.]، بەندبوون لەسەر؛ کەوتنە سەر.
**pendant, pendent** (pen′dənt), *n.* (١) پارچە خشڵێکە کە لە ملوانکەیەک یا بازنێکەوە شۆڕ بووبێتەوە؛ گوارە. (٢) ئاوێزە؛ چل چرا.
(٣) پەیکەرێکی جوانی شۆڕبووەوەیە لە بنمیچێکەوە.
(٤) زرێزە یا ئەڵقەی کاتژمێری گیرفان.
(٥) پەتی شۆڕبووەوە لە تەوەری کەشتییەوە.
(٦) تاکی جووتە شتی دەقاودەق یا لەیەکچوو.
*adj.* شۆڕبووەوە؛ هەڵواسراو.
**pendent, pendant** (pen′dənt), *adj.* (١) شۆڕبووەوە؛ هەڵواسراو.
(٢) دەرپۆقیو.
(٣) بڕیار نەدراو؛ بە لایەکدا نەکەوتوو؛ نەبڕاوەتەوە.
**pending** (pen′diŋ), *adj.* (١) بڕیار نەدراو؛ یەکلایی نەکراوە؛ ساغ نەکراوە. (٢) خەریکی ڕوودانە؛ نزیکی ڕوودانە.
*prep.* (١) لەماوەی؛ لەکاتی: *( ~ these discussions)* .
(٢) هەتا؛ تاکو؛ تا ئەو کاتەی؛ بە چاوەڕوانی شتێکەوە هەتا ڕوودەدات *( ~ his arrival)*
**pendragon** (pen-drag′ən), *n.* فەرماندەری گشتی؛ پێشەوا؛ شازادەی کۆنی ئینگلتەرە.
**pendular** (pen′joo-lēr), *adj.* (١) بەندۆڵی؛ لە بەندۆڵی کاتژمێری گەورە دەچێ (٢) جۆلانێکەر (وەک بەندۆڵ)؛ هاتوچۆکەر؛ شەکاوە
**pendulous** (pen′joo-ləs), *adj.* (١) (ا) شۆڕبووەوە؛ هەڵواسراو. بە شلی. (ب) جۆلانێکەر (بەندۆڵی کاتژمێر)؛ هاتوچۆکەر. (٢) ڕاڕا؛ دوودڵ.
**pendulum** (pen′joo-ləm, pen′d'l-əm), *n.* (١) بەندۆڵی- کاتژمێر. (٢) شتێکە کە هەمیشە دێت و دەچێ وەکو جۆلانە؛ شتێکی هەمیشە

گۆڕاو: *( the ~ of public opinion)* .

**peneplain, peneplane** (pē′nə-plān′), *n.* زەوی نەختکراو بە داشۆران یا داخورانەوە.

**penetrability** (pen′i-trə-bil′ə-ti), *n.* توانای پێداچوون بوون.

**penetrable** (pen′i-trə-b'l), *adj.* کون دەکرێ؛ پێداچوونی لە توانادایە.

**penetralia** (pen′ə-trā′li-ə), *n.pl.* (١) ناوجەرگە (پەرستگا)؛ ناخ؛ ناوی ناوەوە (٢) شتی شاراوە؛ شتی پەنهانی.

**penetrant** (pen′ə-trənt), *adj.* تیژ؛ کونکەر؛ بڕ؛ پێداچوو.

**penetrate** (pen′ə-trāt′), *v.t.* (١) پێداچوون؛ کونکردن؛ پێدا تێپەڕبوون (٢) پێدا بڵاوبوونەوە؛ هەموو گرتنەوە (٣) زۆر کارتێکردن. (٤) تێگەیشتن

*v.i.* (١) کونکردن؛ پێداچوون. (٢) زۆر کارکردنە سەر مێشك.

**penetrating** (pen′ə-trāt′iŋ), *adj.* (١) تیژ؛ بەتین *( a ~ sound or smell)* . (٢) قووڵ؛ زۆری بڕیوە: *( a ~ wound)* . (٣) زیرەك؛ ڕێ بەدییکەر؛ تیژ: *( a ~ mind; ~ insight)* .

**penetration** (pen′ə-trā′shən), *n.* (١) کونکردن؛ پێداچوون؛ پێدا تێپەڕبوون (٢) توانای پێداچوون یا کونکردن. (٣) قووڵی (بڕینی گوللە بۆ نیشانەکەی پاش پێکانی). (٤) مێشك تیژی؛ زیرەکی؛ ڕێ بەدیبی.

**penetrative** (pen′ə-trā′tiv), *adj.* تیژ؛ کونکەر

**penetrometer** (pen′ə-trŏ′mə-tẽr), *n.* (١) پێوەری هێزی بڕین یا برکردنی تیشکی ئێکس. (٢) پێوەری ڕادەی پێداچوونی تەنی نیمچە ڕەق.

**penguin** (peŋ′gwin, pen′gwin), *n.* پەنگوین: باڵندەیەکی ناوی ناوچە ساردەکانە پێی پەردەدارە ناتوانێ بفڕێ

**penholder** (pen′hōl′dẽr), *n.* قەڵەمدان

**penicillin** (pen′ə-sil′in), *n.* پەنسلین (دەرمان).

**penicillium** (pen′ə-sil′i-əm), *n.* پەنسلیوم: کەڕووی نان و پەنیرو میوەی گەنیو (لە هەندێ جۆرە کەڕووی تایبەتی دەرمانی پەنسلین وەردەگیرێ).

**peninsula** (pə-nin′sə-lə, pə-nin′syoo-lə), *n.* سێلاو؛ نیمچە دوورگە

**penis** (pē′nis), *n.* کێر.

**penitence** (pen′ə-təns), *n.* تۆبە؛ تۆبەکردن؛ پەشیمانی.

**penitent** (pen′ə-tənt), *adj.* پەشیمان؛ تۆبەکەر.

*n.* تۆبەکارێك؛ کەسێکی پەشیمان.

**penitential** (pen′ə-ten′shəl), *adj.* تۆبەیی؛ پەشیمانی؛ تۆبەکاری.

*n.* (١) تۆبەکارێك؛ کەسێکی پەشیمان (٢) لیستە یا نامیلکەی پەیڕەوییەکانی کڵێسە دەربارەی تۆبەکردن.

**penitentiary** (pen′ə-ten′shə-ri), *adj.* (١) تایبەتی بە تۆبەکاری؛ تۆبەیی (٢) بۆ سزادان و ڕاستکردنەوە بەکاردێت: *( a ~ device)* . (٣) سزای لەسەرە؛ سزای ئەو کەسە دەدرێ کە بیکات: *( a ~ offense)* .

*n.* (١) بەندیخانە (بەتایبەتی هی تاوان و تاوانکاری ترسناك)؛ تۆبەخانە (٢) (أ) ئەنجوومەنی تۆبەکاری کڵێسەی کاسۆلیکی. (ب) کاربەدەستی لێپرسراوی تۆبەکاری لە کڵێسەدا

**penknife** (pen′nīf′), *n.* قەڵەمبڕ؛ چەقۆی بچووك

**penman** (pen′mən), *n.* (١) ڕوونووسکار؛ لەبەرنووس؛ ڕوونووسەر (٢) خۆشنووس؛ خەتخۆش (٣) نووسەر

**penmanship** (pen′mən-ship′), *n.* (١) خۆشنووسی؛ خەتخۆشی؛ هونەری خۆشنووسی. (٢) شێوازێکی تایبەتی خۆشنووسی.

**penna** (pen′ə), *n.* پەڕی دەرەوەی باڵندە

**pen name,** ناوی نهێنی نووسەر: ئەو ناوەی نووسەر لەباتی ناوی ڕاستەقینەی خۆی بەکاری دەهێنێت.

**pennant** (pen′ənt), *n.* (١) ئاڵای سێگۆشەی بارێك (کە دەکرێ بە درووشمی قوتابخانە. تیپی یاری. کەشتی... هتد). (٢) ئاڵایەکی وەها کە دەکرێ بە خەڵاتی تیپی براوە یا بە درووشمی بردنەوەکە.

**pennate** (pen′āt), *adj.* = pinnate.

**pennated** (pen′ā-tid), *adj.* = pennate.

**penni** (pen′i), *n.* پارەیەکی فنلەندییە.

**penni-** (pen′i), پێشگرێکە بەمانای: پەڕ؛ لە پەڕ دەچێ: *( penniform)*

**penniform** (pen′i-fôrm′), *adj.* وەك پەڕ؛ لە پەڕ دەچێ.

**penniless** (pen′i-lis), *adj.* بێ پووڵ و پارە؛ هەژار؛ نابووت.

**pennon** (pen′ən), *n.* (١) ئاڵای سێگۆشەیی بارێکی سوارچاك. (٢) **pennant** . (٣) ئاڵا. (٤) پەڕ؛ باڵ.

**penny** (pen′i), *n.* (١) پێنس: پارەیەکی ئینگلیزییە دوانزەیەکی " شلنگ "ێکە. (٢) سەنت: پارەیەکی ئەمەریکی و کەنەداییە بریتییە لە سەدیەکی دۆلارێك. (٣) فلس؛ پووڵ؛ پارەی کەم نرخ. (٤) پارەیەکی زۆر؛ هەندێکی زۆر پارە: *( a pretty ~ )* .

**a penny for your thoughts,** ئەم وتەیە بە کەسێك دەوترێ کە دالغەی لێدابێ و ئاگای لە کەسانی دەورووپشتی نەمابێ بەمانای: " ئەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە فلسێك ناهێنێ " .

**a pretty penny,** [Colloq.], بڕێکی زۆر پارە؛ پارەیەکی زۆر.

**penny-wise and pound-foolish,** پووڵ بە پووڵ کۆی دەکاتەوەو بە قرپ دایدەنێ؛ لە شتی هیچ‌وپووچدا ووریایەو دەست بە خۆیەوە دەگرێ بەڵام لە شتی گرنگدا هیچ.

**turn an honest penny,** بە ئارەقی ناوچەوان پارە پەیداکردن؛ بە سەرڕاستی پارە پەیداکردن.

**penny-a-line** (pen′i-ə-līn′), *adj.* (١) هەر بۆ دێڕێك فلسێکی دەدرێتێ. (٢) هەرزانبەها (نووسین)؛ قەڵب؛ ڕەشۆکی.

**penny-a-liner** (pen′i-ə-līn′ẽr), *n.* نووسەرێکی بە کرێ گیراوی ڕۆژنامە کە بۆ هەر دێڕێك فلسێك وەردەگرێ؛ نووسەری بازاڕی

**penny ante,** یارییەکی پۆکەرە کە گرەوی بچووکی لەسەر دەکرێ.

**penny pincher,** [Colloq.], پوولەکی؛ پارەپیس؛ ڕەزیل؛ پیسکە.

**pennyroyal** (pen′i-roi′əl), *n.* (١) ڕووەکێکە لە توخمی نەعنا. (٢) ڕۆنی ئەم ڕووەکە.

**pennyweight** (pen′i-wāt′), *n.* کێشانەیەکی زۆر سووکە بریتییە لە بیست یەکی " ئاونس " ێك یا ١٥٥٥ گرام.

**penny-wise** (pen′i-wīz′), *adj.* ووریا و پوولەکییە کە دێتە سەر پارەی کەم و شتی هیچ‌وپووچ.

**penny-wise and pound-foolish,** پووڵ بە پووڵ کۆی دەکاتەوەو بە قرپ دایدەنێ؛ لە شتی هیچ‌وپووچدا ووریایەو دەست بە خۆیەوە دەگرێ بەڵام لە شتی گرنگدا هیچ.

**pennywort** (pen′i-wûrt′), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکی گەڵا خڕن لە درزە بەردو دیوارو زەلکاودا دەڕوێن.

**pennyworth** (pen′i-wûrth′), *n.* (١) بایی پەنس یا پوولێك. (٢) کڕینی شتێك بە هەرزان؛ بایەخی شتێك بەرامبەر بەو پارەیەی پێی دراوە: *( a good ~ )* (٣) نەختێك؛ هەندێك؛ تۆزێك؛ بڕێکی کەم.

**penology, poenology** (pē-nol′ə-ji), *n.* زانستی بەندیخانە بەڕێوەبردن و ڕاستکردنەوەی تاوانکاران.

-penological *(adj.)*; penologist *(n.)*.

**pensile** (pen′sil), *adj.* (١) شۆڕبووەوە؛ هەڵواسراو. (٢) هێلانەی شۆڕبووەوە کردوو.

**pension** (pen′shən), *n.* (١) مانگانەی خانەنشینی. (٢) بەخشیشی سەرومڕە کە کەسێکی پارەدار بۆ هونەرمەندێکی دەبڕێتەوە

*v.t.* خانەنشین کردن بە مانگانەوە.

**pension off,** خانەنشین کردن بە مانگانەوە؛ دەرکردن لە کارو مانگانە پێدان.

**pension** (pon′si-on′), *n.* پەنسیۆن: میوانخانەیەکی ئەورووپاییە.

**pensionary** (pen′shən-er′i), *adj.* (١) هی مووچەی خانەنشینی؛

به مووچەی خانەنشینی دانراو. (٢) بە کرێ گیراو؛ چاوەڕێی دەستی خەڵك.
*n.* (١) مووچەی خانەنشینی وەرگر. (٢) بە کرێ گیراو؛ دەسکەلا.
**pensioner** (pen′shən-ēr), *n.* (١) خانەنشین بە مانگانەوە؛ خانەنشین. (٢) کەسێکە کە بە خێرو بەخشیشی کەسێکی تر دەژی.
**pensive** (pen′siv), *adj.* (١) مات؛ لە بیری قووڵو خەمناکدا: ***(a ~ mood)***
(٢) ماتیو دڵتەنگی گەیەنەر (هۆنراوە)؛ بیری قووڵو پڕ لە خەم دەربڕ.
**penstock** (pen′stok′), *n.* (١) دەرگای عەماراو (بۆ دابینکردنی لافاو). (٢) ئاوبارە؛ بۆری ئاو یا جۆگەی ئاوبردن بۆ گەردوونە.
**pent** (pent), *alternative past tense and p.p. of* pen.
*adj.* قەتیس کراو؛ پەنگ خواردووەوە؛ گیراو؛ پێ پەست کراو: ***(~ -up emotion)***
**penta-, pent-** (pen′tə), پێشگرێکە بەمانای: پێنج: ***(pentameter, pentagon)***
**pentacle** (pen′tə-k'l), *n.* ئەستێرەیەکی پێنج گۆشەییە وەك نیشانەیەکی جادووگەری بەکاردەهێنرێ.
**pentad** (pen′tad), *n.* (١) پێنج؛ ژمارە پێنج (٢) دەستە یا زنجیرەی پێنجی. (٣) چەرخێکی پێنج ساڵی.
**pentadactyl** (pen′tə-dak′til), *adj.* پێنج پەنجەیی.
**pentagon** (pen′tə-gon′), *n.* وێنەی پێنج گۆشەیی یا پێنج سووچ؛ پێنج لا
**the Pentagon,** پێنتاگۆن: بارەگای وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا.
**pentagonal** (pen-tag′ə-n'l), *adj.* پێنج گۆشەیی؛ پێنج لایی.
**pentagram** (pen′tə-gram′), *n.* (١) pentacle. (٢) وێنەیەکی پێنج هێڵی.
**pentahedron** (pen′tə-hē′drən), *n.* وێنەی بەرجەستەی پێنج لا یا پێنج ڕوو (ئەندازە).
-pentahedral *(adj.).*
**pentamerous** (pen-tam′ēr-əs), *adj.* پێنج بەشی (ڕووەکناسی، زیندەوەرناسی)
**pentameter** (pen-tam′ə-tēr), *n.* (١) دێڕێکی پێنج کێشی هۆنراوە. (٢) هۆنراوەی پێنج کێشی
**pentangular** (pen-taŋ′gyoo-lēr), *adj.* پێنج گۆشەیی.
**pentathlon** (pen-tath′lən, pen-tath′lon), *n.* بۆربۆڕێنی- پێنجی: بۆربۆڕێنێکی وەرزشییە بریتییە لە بەشداربوونی هەموو یاریکەرێك لە پێنج ملەمنێدا.
**pentavalent** (pen′tə-vā′lənt, pen-tav′ə-lənt), *adj.* پێنج- هاوهێزی (کیمیا)
**pentecost** (pen′ti-kôst′, pen′ti-kost′), *n.* جەژنێکی جوولەکەو خاچ پەرستانە.
**pent-up** (pent′up′), *adj.* قەتیس کراو؛ پەنگ خواردووەوە؛ گیراو؛ پێ پەست کراو ***(~ emotion)***.
**penult** (pē′nult, pi-nult′), *n.* شتی بەر لە دواترین شت (بەتایبەتی بڕگەی پێش دوابڕگەی ووشەیەك).
**penultimate** (pi-nul′tə-mit), *adj. & n.* = penult.
**penumbra** (pi-num′brə), *n.* (١) نیمچە سێبەر (لەنێوان سێبەری تەواوو ڕووناکی تەواودا). (٢) (ا) نیمچە سێبەری دەوروپشتی خاڵە ڕەشەکانی خۆر. (ب) نیمچە سێبەری دەوری مانگی گیراو. (٣) چێوە؛ دەوروپشت.
**penurious** (pə-nyoor′i-əs, pə-noor′i-əs), *adj.* (١) پیسکە؛ ڕەزیل؛ پارەپیس؛ پوولەکی. (٢) ڕووتەنی؛ بێ بەرهەم: ***(a ~ land)***.
**penury** (pen′yoo-ri), *n.* (١) هەژاری؛ نەبوونی؛ بێ دەرامەتی. (٢) کەمی؛ بێ بەرهەمی (زەوی)؛ کەم بەرهەمی؛ قاتی؛ شت نەبوونی.
**peon** (pē′ən), *n.* (١) (ا) کرێکاری ئەمەریکای لاتینی (ب) کەسێکی بێگارپێکراو؛ کەسێکە کە ئیشی پێ دەکرێ لەباتی قەرزدانەوە. (٢) (ا) سەربازی پیادەی هیندی (ب) پۆلیسی هیندی. (ج) بەردەست.
**peonage** (pē′ən-ij), *n.* (١) بێگارپێکردنی کەسانی قەرزار لەباتی قەرزدانەوە؛ بەکرێدانی بەند لەلایەن میرییەوە بەو کەسانەی کە دەیانەوێ ئیشیان پێ بکەن. (٢) کرێکاری؛ باری ژیانی کرێکار.
**people** (pē′p'l), *n.* (١) گەل؛ نەتەوە؛ میللەت.
(٢) دانیشتوانی شارێك یا شوێنێك؛ خەڵك: ***(the ~ of NewYork)***.
(٣) دەستوپێوەند.
(٤) تاقم؛ ئەندامانی کۆمەڵە، چین، یا پیشەی خۆ.
(٥) کەس وکار؛ خزم؛ خزمو کەس وکار؛ باووباپیر.
(٦) جەماوەر؛ خەڵك؛ بۆرەپیاوان.
(٧) هاوولاتیان یا دەنگدەرانی وولاتێك.
(٨) ئەمورنەو؛ خەڵك: ***(I don't care what ~ say.)***.
(٩) توخم (گیاندار). (١٠) مرۆڤ؛ ئادەمیزاد.
*v.t.* ئاوەدانکردنەوە؛ خەڵك تێدا نیشتەجێکردن؛ پڕکردن لە خەڵك.
**people's front,** بەرەی نیشتمانی؛ بەرەی میللی.
**pep** (pep), *n.* [Colloq.], چوستوچالاکی؛ تین؛ جۆش؛ ووزە؛ زیندووێتی.
*v.t.* [Colloq.], **( ~ up ),** بزواندن؛ زیندووکردنەوە؛ خستنەجۆش.
**peplos, peplus** (pep′ləs), *n.* بەرگێکی وەك دەستماڵ یا ملپێچی ئافرەتی یۆنانی کۆنە.
**peplum** (pep′ləm), *n.* (١) peplos. (٢) بەرگێکی چرچی زۆر کورتە لە کەمەرەوە شۆڕ دەبێتەوە بەسەر تەنوورەدا.
**pepper** (pep′ēr), *n.* (١) بیبەر؛ دەلوبیبەر. (٢) ئاڵەت. (٣) ئاڵەتی سوور.
*v.t.* (١) ئاڵەت پێوەکردن. (٢) زۆر پێوەکردن (بەهارات). (٣) تێگرتن (گوللە، پرسیار). (٤) بیرازکردن؛ کوتان؛ تێهەڵدان.
**pepper-and-salt** (pep′ēr-'n-sôlt′), *adj.* ماش وبرنج (ڕەنگ): ***(a ~ beard, moustache, hair)***
**pepperbox** (pep′ēr-boks′), *n.* ئاڵەتدان (بۆ ئاڵەت کردن بە خواردنەوە).
**peppercorn** (pep′ēr-kôrn′), *n.* (١) دەنکە ئاڵەت. (٢) شتێکی هیچوپووچو بێ نرخ.
**peppermint** (pep′ēr-mint′), *n.* (١) نەعنا. (٢) ئارەقی نەعنا. (٣) نوقڵی نەعنا.
**pepper pot,** (١) pepperbox. (٢) چەند جۆرە چێشتێکی شلەی گۆشتو سەوزەی تیژە.
**pepper tree ( or shrub ),** داربیبەر: دارێکی هەمیشە سەوزی گەڵا باریكو بچکۆلەی لق شۆڕبووەوەیە.
**peppery** (pep′ēr-i), *adj.* (١) ئاڵەتاوی؛ توون؛ تیژ. (٢) توندوتیژ (ووتار، نووسراو)؛ بڕ. (٣) تەنگەجیکڵانە؛ سەرگەرم؛ تووڕەوتڕۆ.
-pepperiness *(n.).*
**peppy** (pep′i), *adj.* [Slang], کورج وگۆڵ؛ چوستوچالاك؛ قیت؛ زیت.
**pepsin** (pep′sin), *n.* پێپسین: (ا) ماددەیەکی لیکاوی ترشەڵۆکە لە گەدەدا خواردەمەنی پرۆتینی دەگۆڕێ بۆ شێوەیەکی ئاسانتر بۆ هەرسکردن: ئاووگی هەرس. (ب) هەمان ماددە کە لە گەدەی مەڕو گوێرەکەو بەراز دەگیرێتو بۆ دەرمانی هەرس بەکاردەهێنرێ.
**pepsinogen** (pep-sin′ə-jən), *n.* ماددەیەکە لە لووەکانی گەدەدا ئاووگی هەرس یا پێپسینی لێوە پەیدا دەبێ (ووشەی پێشوو ببینە)
**peptic** (pep′tik), *adj.* (١) یارمەتیدەری هەرس؛ بۆ هەرس باشە. (٢) هەرسکەر. (٣) تایبەتی بە ئاووگی هەرس؛ لە ئاووگی هەرسەوە پەیدابوو (برینی گەدەو ڕیخۆڵە): ***(a ~ ucler)***.
**peptize** (pep′tīz), *v.t.* گۆڕین بۆ شلەیەکی لیقن.
**peptone** (pep′tōn), *n.* ماددەیەکە لە هەرسکردنی پرۆتین پەیدا دەبێ.
**peptonize** (pep′tə-nīz′), *v.t.* لە پرۆتینەوە کردن بە " پێپتۆن " بە هۆی ئاووگی هەرسەوە.

**per** (pũr; *unstressed* pẽr), *prep.* (١) بەھۆی؛ لەڕێی؛ بە:
***( ~ bearer)***
(٢) هەر دانەی؛ هەر یەکی؛ هەر...
***( one dollar ~ gallon; ~ person; ~ kilogram)***
***( twenty ~ cent)*** (٣) لە
***( ~ instructions)*** (٤) بەپێی؛ بەگوێرەی؛ لەسەر.
**per-** (pũr: *unstressed* pẽr), پێشگرێکە بەمانای: (ا) بەناو؛ پێیدا. ***( percolate)*** (ب) بەتەواوی؛ زۆر. ***( persuade)***.
(ج) هاوبەشی ماددەیەکی زیاتر لە ئاسایی (کیمیا).
**peracid** (pũr′as′id), *n.* پێراسید: ترشەڵۆکێکە ئۆکسجینی زیاتر تێدایە لە ترشەڵۆکی هاوچەشنی تر
**peradventure** (pũr′əd-ven′chẽr), *adv.* [Archaic]. (١) بۆی هەیە؛ لەوانەیە. ***( ~ it will rain.)***
(٢) بەڕێکەوت: ***( If, ~ , he comes.)***
*n.* [Archaic], گومان. ***( We shall win, without ~ .)***
**perambulate** (pẽr-am′byoo-lāt′), *v.t.* (١) بە پێ پێدا ڕۆیشتن؛ بە پێ بڕین؛ پێدا گەڕان؛ پیاسە پێداکردن (٢) بە پێ پێدا گەڕان بۆ پشکنین و سنوور دیاریکردن یا ڕووپێوان
*v.i.* بە پێ ڕۆیشتن؛ گەڕان؛ پیاسەکردن
**-perambulation** *(n.)*.
**perambulator** (pẽr-am′byoo-lā′tẽr), *n.* (١) پیاسەکەر؛ گەڕۆک؛ پیادەی ڕووی زەوی و سنوور دیاریکەر (٢) ئامێری پێوانی دووری ڕووپێو بەکاری دەهێنێ. (٣) [Chiefly British]، عەرەبانەی منداڵ.
**per annum** (pẽr an′əm), [L.]. سالانە؛ هەر ساڵەی؛ ساڵی
**percale** (pẽr-kāl′, pẽr-kal′), *n.* قوماشێکی لۆکەیە؛ چیت
**per capita** (pẽr kap′ə-tə), [L.]. هەرکەسی؛ سەری:
هەموو یەکێک؛ بۆ هەموو مرۆڤێک. ***( ~ income)***
**perceivable** (pẽr-sē′və-b′l), *adj.* (١) هەستی پێ دەکرێ؛ دەبینرێ (٢) مرۆڤ دەتوانێ تێی بگات؛ دەتوانرێ بزانرێ
**perceive** (pẽr-sēv′), *v.t.* (١) تێگەیشتن؛ بینین (بە مێشک)؛ هێنانە بەرچاوی خۆ. (٢) هەست پێکردن؛ پێزانین؛ بینین
**percent, per cent** (pẽr-sent′), *n.* لە سەدا؛ دەڵێن لە سەدا ئەوەندە وە نیشانەکەیشی ئەمەیە ٪ ***( ten ~ )***
**percentage** (pẽr-sen′tij), *n.* (١) ڕێژەی سەدی
(٢) ڕێژە؛ ڕێدە؛ بەش:
***( only a small ~ of books are worth reading.)***
(٣) [Colloq.]، کەڵک؛ سوود
**percentile** (pẽr-sen′til, pẽr-sen′tīl), *n. & adj.* هەر یەکە لە پلەکانی ڕێژەی سەدی (ژمێرکاری)؛ پلە یا بەشی سەدی.
**percentum** (pẽr sen′təm), [L.]. = per cent.
**percept** (pũr′sept), *n.* شتێکی هەست پێکراو (بە مێشک یا بە ئەندامەکانی هەست)؛ شتێکی هێنراوە بەرچاو (بە مێشک).
**perceptible** (pẽr-sep′tə-b′l), *adj.* (١) هەست پێکراو؛ دیار؛ بە چاو بینراو؛ پێ زانراو (بە مێشک یا بە هەست). (٢) ئەوتۆ؛ زۆر؛ دیار؛ بینراو ***( a ~ change in him)***
**-perceptibility** *(n.)*.
**perceptibly** (pẽr-sep′tə-bli), *adv.* (١) بە شێوەیەک کە ببینرێ یا هەستی پێ بکرێ (٢) بە جۆرێکی ئەوتۆ؛ تا ڕادەیەک؛ نێجگار
**perception** (pẽr-sep′shən), *n.* (١) هەست پێکردن؛ ئاگا لێ بوون؛ بینین (مەجاز) (٢) شێوە و توانای تێگەیشتن یا هەست پێکردن؛ بینایی (٣) شتی هەست پێکراو یا تێگەیشتراو (٤) وا هاتنە بەرچاو؛ وا تێگەیشتن؛ وا بۆچوون (٥) ڕێ بەدیی؛ هەست تیژی
**perceptive** (pẽr-sep′tiv), *adj.* (١) تایبەتی بە هەست پێکردن و تێگەیشتن ***( ~ faculties)***
(٢) هەست تیژ؛ بەسەرنج؛ وردبین؛ بزان؛ ڕێ بەدییکەر ***( a ~ person)***.

**-perceptively** *(adv.)*; **perceptivity** *(n.)*; **perceptiveness** *(n.)*.
**perceptual** (pẽr-sep′choo-əl), *adj.* تایبەتی بە هەست پێکردن؛ دەکەوێتە سەر تێگەیشتن و هەستکردن؛ هی هاتووە بەرچاو.
**-perceptually** *(adv.)*.
**perch** (pũrch), *n.* جۆرە ماسییەکی ڕووبارە.
**perch** (pũrch), *n.* (١) جێی نیشتنی باڵندە (لقەدار، درەخت... هتد).
(٢) (ا) جێ (بەتایبەتی جێیەکی بەرز و بەدەرەوە):
***( his new ~ as president)***
(ب) جێی دانیشتن یا وەستان؛ کورسی؛ شوێنی بەرز.
(٣) پێوانەیەکی درێژییە بریتییە لە پێنج یارد و نیو (بەتایبەتی بۆ زەوی).
(٤) پێوانەیەکی ڕووبەرە بریتییە لە سی یاردە و چواریەکی یاردەیەک.
(٥) پێوانەیەکی بەردە. (٦) شەفتی گالیسکە.
*v.i.* نیشتن؛ هەڵنیشتن؛ هەڵترووشکان؛ چیچکەکردن.
*v.t.* دانان لەسەر شوێنێکی بەرز؛ هەڵنیشاندن؛ هەڵچوچکاندن.
**perchance** (pẽr-chans′, pẽr-chäns′), *adv.* (١) بەڕێکەوت.
(٢) perhaps
**perchlorate** (pẽr-klōr′āt, pẽr-klō′rāt), *n.* خوێی ترشەڵۆکی پێرکلۆریک.
**perchloric acid,** ترشەڵۆکی پێرکلۆریک.
**percipience** (pẽr-sip′i-əns), *n.* = perception.
**percipient** (pẽr-sip′i-ənt), *adj.* هەست تیژ؛ وردبین؛ بەسەرنج.
*n.* کەسێکی هەست تیژ یا وردبین.
**percolate** (pũr′kə-lāt′), *v.t.* (١) پاڵاوتن
(٢) تێزاندن؛ دەڵاندن؛ دادان.
(٣) قاوە لێنان؛ جۆشدان (قاوە): ***( to ~ coffee)***.
*v.i.* پاڵێوران.
*n.* شلەی پاڵێوراو.
**-percolation** *(n.)*.
**percolator** (pũr′kə-lā′tẽr), *n.* جەزوە؛ ئامێری قاوە لێنان
**per contra** (pẽr kon′trə), [L.], بەپێچەوانەوە.
**percuss** (pẽr-kus′), *v.t.* لێدان (وەک بە سەری پەنجە یا کەشک لێدانی سنگ و پشتی نەخۆش لەلایەن پزیشکەوە).
**percussion** (pẽr-kush′ən), *n.* (١) لەیەکتردانی دوو شت و تەقە لێ هەڵساندنی. (٢) تەقە. (٣) تەقینەوەی بارووتی فیشەک.
(٤) بە سەری پەنجە یا کەشک لێدانی سنگ و پشتی نەخۆش لەلایەن پزیشکەوە.
(٥) دەنگدانەوەی شەپۆلی دەنگ لە گوێدا؛ دەنگ بەر گوێ کەوتن.
(٦) سەرجەمی ئامێری مۆسیقی بە دەست لێدراو یا بەیەکدا کێشراو (تەپڵ، پیانۆ... هتد).
**percussion cap,** تەرەقە؛ قاوغی بارووتی فیشەک.
**percussion instrument,** ئامێری مۆسیقی بە دەست لێدراو یا بەیەکدا کێشراو (تەپڵ، پیانۆ، زەنگ، دەهۆڵ... هتد).
**per diem** (pẽr dī′əm), [L.], (١) هەر ڕۆژی.
(٢) ڕۆژانە: خەرجییەکی ڕۆژانەیە دەدرێت بە فەرمانبەر لەسەروو موچەکەیەوە بۆ کرێی خواردن و نووستن لەکاتی چوونە دەرەوەی شار یا وڵاتدا بە کاروباری میری یا کۆمپانیاکەی.
**perdition** (pẽr-dish′ən), *n.* (١) نەمان؛ فەوتان؛ لەناوچوون.
(٢) (ا) لەعنەت لێکرانی هەتاهەتایی؛ خرانە جەهەننەم هەتاهەتا؛ چوونە دۆزەخ
(ب) دۆزەخ.
**perdu, perdue** (pẽr-dōō′, pẽr-dū′), *adj.* شاراوە؛ نەبینراو (وەک لەناو بۆسەیەکدا)؛ لەچاو ون.
*n.* سەربازێک یا دەستەیەک سەرباز کە ئەرکێکی پڕ مەترسیان درابێ بەسەر شاندا.
**perdurable** (pẽr-door′ə-b′l, pẽr-dyoor′ə-b′l), *adj.* قایم؛ زۆر بەرگەگر؛ هەرگیز نەشکاو و پەک نەکەوتوو؛ هەرگیز نەفەوتاو.
**peregrinate** (per′ə-gri-nāt′), *v.i.* گەشتکردن؛ گەڕان؛

گەڕان بە وولاتی بێگانەدا؛ کۆچەرێتی کردن.

***v.t.*** بەناودا گەڕان یا گەشتکردن.

-peregrination *(n.)*; peregrinator *(n.)*.

**peregrine** (per′ə-grin, per′ə-grin′), ***adj.*** (١) بێگانە (٢) گەڕۆك؛ کۆچەر

***n.*** جۆرە هەڵۆیەکی گەورەو خێرایە.

**peregrine falcon,** هەڵۆیەکی گەورەو خێراو پەڕ سپیی و بۆرە

**peremptory** (pēr-emp′tēr-i), ***adj.*** (١) دوا؛ نەگۆڕ (بڕیاری دادگا)؛ کۆتایی بێ هێنەر؛ ئیتر چەندوچوونی لەسەر ناکرێ: ***( a ~ writ)*** .
(٢) فەرمانی؛ بەرپەرچی نادرێتەوە؛ دەبێ هەر ببێ؛ دوانەخراو.
(٣) دیکتاتۆری؛ زۆرداری؛ توندوتیژ؛ لەخۆبایی؛ خۆبادەر: ***( a ~ manner)*** .

-peremptorily *(adv.)*; peremptoriness *(n.)*.

**perennial** (pə-ren′i-əl), ***adj.*** (١) بە درێژایی سال هەیەو بەردەوامە.
(٢) هەمیشەیی؛ درێژخایەن؛ دوایی نەهاتوو: ***( ~ youth)*** .
(٣) جار لەدوای جار سەرهەڵدەداتەوە.
(٤) چەند ساڵی (رووەك)؛ لە دوو ساڵ زیاتر ژیاو: ***( a ~ plant)*** .

***n.*** رووەکێکی چەند ساڵی یا لە دوو ساڵ زیاتر ژیاو.

-perennially *(adv.)*.

**perfect** (pūr′fikt), ***adj.*** (١) تەواو؛ بێگەرد؛ بێ کەموکووڕی؛ زۆرباش؛ نموونەیی (٢) دەقاودەق ***( a ~ copy)***
(٣) تەواو؛ بەبێ کەموزیاد: ***( a ~ fool)***
(٤) نێرو مێرەکی لە هەمان گوڵدایە
(٥) تایبەتی بە باری کرداری تەواو (واتە کە کارەکە تەواو کرابێ) لەکاتی دوواندا (ڕێزمان)، وە ئەم باری کرداری تەواوە سێ جۆرە:
(١) simple p rfect (٢) past perfect
(٣) future perfect

***v.t.*** (١) تەواوکردن؛ بە ئەنجام گەیاندن.
(٢) کەموکووڕی لێ دەرهێنان؛ ناتەواوی تێدا نەهێشتن؛ بێگەردکردن؛ چاکردن تا ئەوپەڕی رادە: ***( He ~ed his imitation of the president.)*** .

***n.*** (١) باری کرداری تەواو (ڕێزمان) (ژمارە پێنج ببینە)
(٢) کردارێك لە باری کرداری تەواودا (ڕێزمان)

**perfectible** (pēr-fek′tə-b′l), ***adj.*** بێگەرد دەکرێ؛ دەتوانرێ بگەیەنرێ بە پلەی تەواوی یا بێ کەموکووڕی.

-perfectibility *(n.)*.

**perfection** (pēr-fek′shən), ***n.*** (١) بێگەردکردن؛ گەیاندنە پلەی تەواوی یا بێ کەموکووڕی:
***( The ~ of the machine took many months.)***
(٢) پلەی تەواوی؛ بێ کەموکووڕی
(٣) نموونەی بێ کەموکووڕی یا تەواوی (مرۆڤ، شت):
***( She was the ~ of beauty and virtue.)***

**to perfection,** بەتەواوی؛ بە ئەوپەڕی باشی یا تەواوییەوە

**perfectionism** (pēr-fek′shən-iz′m), ***n.*** (١) بیروباوەڕێکە کە دەڵێت مرۆڤ دەتوانێ بگاتە پلەی تەواوی یا بێگەردی لەرووی رەوشت و ئایین و کۆمەڵایەتییەوە (٢) ڕازی نەبوون بە هەر کارێك کە لە پلەی بێگەردی یا تەواوی کەمتر بێ

**perfectionist** (pēr-fek′shən-ist), ***n.*** (١) بڕواکەر بەو بیروباوەڕەی کە دەڵێت مرۆڤ بۆی هەیە بگاتە پلەی بێگەردی لە هەموو رووییەکەوە.
(٢) کەسێکی ڕازی نەبوو بە هیچ کارێك یا شتێك ئەگەر نەختێك ناتەواوی هەبێ و لە سەدا سەد بە دڵی خۆی نەبێ.

**perfective** (pēr-fek′tiv), ***adj.*** (١) بەرەو باشی و تەواوی چوو
(٢) تایبەتی بە باری کرداری تەواو (ڕێزمان).

***n.*** (١) باری تەواوی کردار (ڕێزمان) (٢) کردارێکی باری تەواو.

**perfectly** (pūr′fikt-li), ***adv.*** (١) بەشێوەیەکی بێگەرد یا تەواو؛ بە ئەوپەڕی تەواوی یا بێگەردییەوە. (٢) بەتەواوی؛ تەواو؛ لە سەدا سەد:
***( ~ black)***

**perfect participle,** = past participle.

**perfervid** (pēr-fūr′vid), ***adj.*** زۆر بەجۆش؛ زۆر بەپەرۆش.

**perfidious** (pēr-fid′i-əs), ***adj.*** ناپاك؛ پەیمان شکێن.

**perfidy** (pūr′fə-di), ***n.*** ناپاکی؛ پەیمان شکێنی.

**perfoliate** (pēr-fō′li-it, pēr-fō′li-āt′), ***adj.*** تایبەتی بە گەڵایەکە کە دەڵێی لاسکەکەی پێداچووە: ***( a ~ leaf)*** .

**perforate** (pūr′fə-rāt′), ***v.t.*** (١) کونکردن؛ کون تێکردن.
(٢) بە ڕیز کون تێکردن (پەڕە کاغەز یا پووڵ بۆ لەیەککردنەوەی بەئاسانی)

***adj.*** ڕیزە کون تێکراو

-perforator *(n.)*.

**perforated** (pūr′fə-rāt′id), ***adj.*** ڕیزە کون تێکراو.
***( a ~ sheet of paper)***

**perforation** (pūr′fə-rā′shən), ***n.*** (١) ڕیزە کون تێکردن؛ ڕیزە کون تێکران؛ ڕیزە کون تێکراوی (٢) ڕیزە کون (کە دەکرێتە پەڕەیەك کاغەزەوە).

**perforce** (pēr-fôrs′, pēr-fōrs′), ***adv.*** بەناچاری؛ لەناواندا.

**perform** (pēr-fôrm′), ***v.t.*** (١) کردن؛ جێبەجێکردن؛ بەجێهێنان؛ پێ هەڵسان: ***( to ~ a task)*** . (٢) نواندن یا پیشاندان (شانۆنامە، مۆسیقا، جادووگەری) ***( to ~ a play)*** .

***v.i.*** نواندن یا پیشاندان (شانۆنامە، مۆسیقا، جادووگەری):
***( to ~ in a play)***

**performance** (pēr-fôr′məns), ***n.*** (١) کردن؛ جێبەجێکردن؛ بەجێهێنان؛ پێ هەڵسان: ***( to be faithful in the ~ of one's duties)***
(٢) کارێکی گرنگ؛ کارێکی جێبەجێکراو.
(٣) (ا) خۆنواندن (شانۆنامە) (ب) شێوازی خۆنواندن.
(٤) شێوەی باش و خراپی کارکردنی مەکینەیەك یا ئامێرێك؛ کاریگەری مەکینە
(٥) نواندن یا پیشاندانێکی گشتی (شانۆنامە، ئاهەنگی مۆسیقا)

**performer** (pēr-fôr′mēr), ***n.*** هونەرمەندی سەماکەر، گۆرانی بێژ، یا شانۆ.

**perfume** (pēr-fūm′), ***v.t.*** بۆن لێدان؛ گوڵاو پێوەکردن.

***n.*** گوڵاو؛ بۆنی خۆش؛ بۆن.

**perfumer** (pēr-fūm′ēr), ***n.*** (١) گوڵاوفرۆش؛ بۆنفرۆش؛ فرۆشیارو دروستکەری بۆنی خۆش (٢) بۆن خۆشکەر؛ بۆندارکەر.

**perfumery** (pēr-fūm′ēr-i), ***n.*** (١) گوڵاوفرۆشی؛ گوڵاوچێتی
(٢) بۆنی خۆش؛ بۆن؛ گوڵاو بەگشتی. (٣) کارگە یا فرۆشگای بۆن و گوڵاو.

**perfunctory** (pēr-fuŋk′tēr-i), ***adj.*** (١) لاسەرلایی؛ ڕۆتینی؛ بە دڵ نەکراو: ***( a ~ smile, examination, letter, etc.)***
(٢) بێباك؛ بێ دەربەست؛ بەتەنگەوە نەهاتوو؛ لاسەرلا: ***( a ~ teacher)*** .

-perfunctorily *(adv.)*; perfunctoriness *(n.)*.

**perfuse** (pēr-fūz′), ***v.t.*** (١) هەڵپرژاندن؛ داپۆشین (بە شلە یا ڕووناکی)؛ لێ هەڵکێشان؛ هەمووگرتنەوە؛ سەرانسەر پێدا بڵاوکردنەوە؛ پێوەکردن. (٢) تێرژاندن؛ تێکردن؛ پێداکردن یا پێدابردنی شلە.

-perfusion *(n.)*; perfusive *(adj.)*.

**pergola** (pūr′gə-lə), ***n.*** پاڕەوێکی تەنراوە وەك کەپر بۆ رووەك پێداهەڵگەڕان.

**perhaps** (pēr-haps′, pēr-aps′), ***adv.*** (١) بەڵکو؛ ڕەنگە؛ لەوانەیە؛ بەشکو ***( P~ I'll buy it for you.; P~ we'd better go.)***
(٢) بەڕێکەوت: ***( If, ~ , he shouldn't come.)***

**peri** (pēr′i), ***n.*** پەری.

**peri-** (per′i, per′ə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) بەچواردەوریدا؛ ***( perigee)*** (ب) نزیك؛ بەتەنیشت: ***( periscope)***

**periapt** (per′i-apt′), ***n.*** چاوەزار؛ نوشتە.

**pericardiac** (per′ə-kär′di-ak), ***adj.*** = pericardial.

**pericarditis** (per′i-kär-dī′tis), ***n.*** هەوکردنی پەردەی دڵ.

**pericardium** (per′ə-kär′di-əm), ***n.*** پەردەی دڵ.

**pericarp** (per′ə-kärp′), *n.* توێکڵی میوە؛ قاوغ، بەرگ یا
توێکڵی تۆو

**perichondrium** (per′ə-kon′dri-əm), *n.* پێست یا پەردەی
کرکرۆ

**pericranium** (per′ə-kra′ni-əm), *n.* پێستی ئاسەی سەر.

**periderm** (per′ə-dûrm′), *n.* توێکڵ؛ شانەکانی ژێر توێکڵی قەدو
رەگی دار و درەخت و رووەک

**peridium** (pi-rid′i-əm), *n.* بەرگ یا پێستی ئەندامی تۆوی هەندێ
کەروو

**peridot** (per′ə-dot′), *n.* بەردێکی بەنرخی ڕوونی سەوزی زەردباوە

**peridotite** (per′ə-dō′tīt), *n.* بەردێکی بەنرخی ڕەشی قورسی
ئاگرپڕژێنییە

**perigee** (per′ə-jē′), *n.* (١) نزیکترین خاڵی سووڕانەوەی مانگ یا
مانگی دەستکرد بۆ زەوی (٢) نزمترین یا نزیکترین شوێن

-**perigean** *(adj.).*

**perigynous** (pi-rij′ə-nəs), *adj.* نێرەکەی ئەنقەیەك پێکدێنێ
بەدەوری نێرکەکەیدا؛ ڕووەکناسی

**perihelion** (per′ə-hē′li-ən), *n.* نزیکترین خاڵی سووڕگەی
ئەستێرەیەکی گەڕۆك لە خۆرەوە

**peril** (per′əl), *n.* مەترسی؛ ترس

*v.t.* خستنە مەترسییەوە

**perilous** (per′ə-ləs), *adj.* پڕ مەترسی؛ مەترسیدار؛ سامناك.
*( a ~ path, course of action, etc.)*

-**perilously** *(adv.).*

**perimeter** (pə-rim′ə-tẽr), *n.* (١) (١) کەمەرە؛ ژمارەوپێوان،
(ب) درێژی ئەم کەمەرەیە. (٢) سنووری پارێزەرو پارێزراو (سوپا)؛ سنووری-
ئاسایش (٣) سنوور *( A fence marks the ~ of the field.)*.
(٤) ئامێری تاقیکردنەوەی هێزو مەودای بینایی (پزیشکەوانی).

**perimetric** (per′ə-met′rik), *adj.* (١) سنووری؛ کەمەرەیی
(٢) تایبەتی بە پێوانی هێزو مەودای بینایی.

**perimetry** (pə-rim′ə-tri), *n.* پێوانی هێزو مەودای بینایی
(پزیشکەوانی)

**perimorph** (per′ə-môrf′), *n.* بەردە بلووریکە بە چواردەوری
بەردە بلووریکی ترەوە

**perinephrium** (per′ə-nef′ri-əm), *n.* ڕیشاڵی جەوری
دەورووپشتی گورچیلە

**perineum** (per′ə-nē′əm), *n.* ناوگەڵ؛ ناوچەی بەینی کلینچکەو
تووکەبەر کە کێرو قوزو قنگ دەگرێتەوە.

**period** (pêr′i-əd), *n.* (١) سەردەم؛ ماوە؛ دەم؛ کات؛ کاتێکی تایبەتی؛
ئاو؛ قۆناغ (٢) وانە؛ کاتی وانەیەك؛ ماوەی وانەیەك:
*( The first ~ at our school starts at eight o'clock in the morning.)*
(٣) قۆناغی نەخۆشی؛ ماوەی نەخۆشی (٤) بێ نوێژی
(٥) کۆتایی؛ دوایی؛ پایان (٦) چەرخ (زەمینناسی).
(٧) (أ) ڕستەی تەواو؛ ڕستە (ڕێزمان) (ب) خاڵی کۆتایی ڕستە
(ج) خاڵ کە لە کۆتایی ووشەی کورت کراوەدا بەکاردەهێنرێ لە ئینگلیزیدا):
**( N.Y. = New York; Mr. = Mister; adj. = adjective)**

***adj.*** . *( ~ furniture or painting)* هی سەردەمێك یا چەرخێکی تایبەتی

**periodic** (pêr′i-od′ik), *adj.* (١) دەمدەمی؛ سەردەمی؛ ناوبەناوی؛
جاربەجاری (٢) لە سەردەمی ڕێکوپێکدا ڕوودەدات.
(٣) تایبەتی بە ڕستەیەك کە ماناکەی دەرناکەوێ هەتا کۆتاییەکەی نەیەت.

**periodical** (pêr′i-od′i-k'l), *adj.* (١) دەمدەمی؛ سەردەمی؛
ناوبەناوی؛ جاربەجاری (٢) لە سەردەمی ڕێکوپێکدا بڵاوکراوە (گۆڤار).
(٣) تایبەتی بە گۆڤار

*n.* گۆڤار؛ ڕۆژنامە

**periodically** (pêr′i-od′i-k'l-i, pêr′i-od′ik-li), ***adv.*** (١) لە
سەردەمی ڕێکوپێکدا. (٢) جاربەجار؛ دەمدەم؛ ناوبەناو.

**periodicity** (pêr′i-ə-dis′ə-ti), *n.* سەرهەڵدانەوەی ناوبەناوی
ڕێکوپێك (تا)

**periodic sentence,** ڕستەیەکە کە ماناکەی دەرناکەوێ هەتا
کۆتاییەکەی نەیەت.

**periodontal** (per′i-ə-don′t'l), *adj.* هی پووك و بێخ و ناوچەی
دەورووپشتی ددان

**periodontics** (per′i-ə-don′tiks), ***n.pl.*** دانسازی پووك و بێخی
ددان؛ زانستی نەخۆشییەکانی پووك و بێخ و ناوچەی دەورووپشتی ددان

**periosteum** (per′i-os′ti-əm), ***n.*** پەردەی ڕەقی ئێسقان داپۆشەر.

**periostitis** (per′i-os-tī′tis), ***n.*** هەوکردنی پەردەی ئێسقان؛
داگیرسانی دیوی دەرەوەی ئێسقان.

**periotic** (per′i-ō′tik, per′i-ot′ik), ***adj.*** (١) هی دەورووپشتی
گوێ؛ کەوتووەتە دەورووپشتی گوێوە. (٢) هی ئێسقانی گوێی ناوەوە

**peripatetic** (per′i-pə-tet′ik), *adj.* (١) [P-] ، هی فەلسەفەی
ئەرستۆی یۆنانی و قوتابییەکانی (٢) گەڕۆك (گوایە ئەرستۆ بە پیاسەوە
کۆڕی خوێندنی گرتووە لەو باخەدا کە قوتابخانەی بووە).

*n.* (١) [P-] ، قوتابییەکی ئەرستۆ. (٢) کەسێکی گەڕۆك.

**peripheral** (pə-rif′ẽr-əl), ***adj.*** (١) (أ) سنووری.
(ب) کەمەرەیی؛ چێوەیی.
(٢) تایبەتی بە دەرەوە یا ڕووی لەش؛ دەرەکی (توێکاری).
(٣) ناگرنگ: *( a ~ point, idea, thing, etc.)* .
(٤) تایبەتی بە کەرەسەی ناگرنگی لەگەڵ کۆمپیوتەر بەکارهاتوو.

*n.* پارچەیەك کەرەسەی ناگرنگ.

-**peripherally** *(adv.).*

**periphery** (pə-rif′ẽr-i), *n.* (١) کەمەر (ئەندازە)؛ چێوە.
(٢) (أ) سنوور؛ پەڕ (ب) ناوچەی دەورووپشتی سنوور. (ج) دەورووپشت
(٣) ڕووی وێنەی ئەندازەیی (٤) جەمسەری هەستەدەمار.

**periphrase** (per′ə-frāz′), *n.* = **periphrasis.**

**periphrasis** (pə-rif′rə-sis), ***n.*** (١) درێژەپێدان (دووان. نووسین)؛
زۆر لەسەر شت ڕۆیشتن و مەبەست درەنگ دان بەدەستەوە؛ قسە جوینەوە.
(٢) نموونەیەکی درێژەپێدراوی وەهای نووسین و دووان.

**periphrastic** (per′ə-fras′tik), ***adj.*** (١) درێژەپێدراو (دووان.
نووسراو). (٢) بەکارهێنانی کرداری یاریدەدەر یا ئامراز لەباتی گەردانی
کرداری سەرەکی (ڕێزمان): (وەك: **" she did sing. "** لەباتی **" she sang. "**
وە **" the word of his father "** لەباتی **" his father's word "** )

-**periphrastically** *(adv.).*

**perique** (pə-rēk′), *n.* جۆرە تووتنێکی ڕەشی بۆنداری " لویزیانا " یە.

**periscope** (per′ə-skōp′), *n.* دووربینی پاپۆڕی ژێرئاو (کە شتی
سەرئاوی پێ دەبینرێ).

**perish** (per′ish), *v.i.* لەناوچوون؛ نەمان؛ فەوتان؛ مردن؛ ڕزین.

**perishable** (per′ish-ə-b'l), ***adj.*** زوو فەوتاو (میوە، سەوزە)؛
زوو لەناوچوو؛ زوو لە کەڵك کەوتوو؛ زوو خراپ بوو: ***( ~ foods)*** .

*n.* خواردەمەنییەکی زوو لە کەڵك کەوتوو یا خراپ بوو.

**perissodactyl, perisosodactyle** (pə-ris′ə-dak′til), ***adj.***
(١) یەك سمی؛ یەك سمدار (٢) تایبەتی بە گیانداری یەك سمی (ئەسپ. کەر

*n.* گیانداری یەك سمی.

**peristalsis** (per′ə-stal′sis), ***n.*** چوونەوەیەکی ناوبەناوی لەخۆوەی
ڕیخۆڵە کە پاڵ بە خواردەمەنی هەرس کراوەوە دەنێ بەرەو خوار

**peritoneum, peritonaeum** (per′i-tə-nē′əm), ***n.*** چەرمە-
چەقاڵتە؛ پەردەی سك.

**peritonitis** (per′i-tə-nī′tis), ***n.*** هەوکردنی چەرمە چەقاڵتە

**periwig** (per′ə-wig′), ***n.*** = **wig.**

**periwinkle** (per′ə-wiŋ′k'l), ***n.*** مۆرد.

**periwinkle** (per′ə-wiŋ′k'l), *n.* (١) بنج بێچۆکەی دەریایی
(٢) قاقڵەی ئەم گیاندارە دەریایییە بچووکە.

**perjure** (pûr′jẽr), *v.t.* بە درۆ سوێندخواردن لە دادگادا: کە دەبێتە هۆی سزادان.

**-perjurer** *(n.).*

**perjury** (pûr′jẽr-i), *n.* بە درۆ سوێندخواردن لە دادگادا

**perk** (pûrk), *v.t.* (١) ~ up: قوتکردنەوە؛ بەرزکردنەوە
(٢) ~ up: زیتکردنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ کەیف قنج کردن
*( The good news ~ed him up.)*

*v.i.* (١) قووت بوونەوە (گوێ) (٢) بە قنجی ڕۆیشتن
(٢) ~ up: کەیف قنج بوونەوە؛ جۆش تێکەوتن.

**perky** (pûr′ki), *adj.* زیت؛ جوست وچالاک؛ بەدەماخ.

**permanence** (pûr′mə-nəns), *n.* هەمیشەیی؛ هەتاهەتایی؛ نەگۆڕان

**permanency** (pûr′mə-nən-si), *n.* (١) permanence.
(٢) شتێکی هەمیشەیی

**permanent** (pûr′mə-nənt), *adj.* هەمیشەیی؛ نەگۆڕ؛ نێجگاری؛ هەتاسەر.

*n.* [Colloq.], قژ لوول کردنی دەستکرد

**permanent wave,** قژ لوول کردنی دەستکرد.

**permanganate** (pẽr-maŋ′gə-nāt′), *n.* پەرمەنگەنات: خوێی ترشەلۆکی پەرمەنگەنیک (بۆ پاککردنەوە بەکاردێت).

**permanganic acid,** ترشەلۆکی پەرمەنگەنیک

**permeability** (pûr′mi-ə-bil′ə-ti), *n.* توانایی پێداچوون و بڵاوبوونەوە

**permeable** (pûr′mi-ə-b'l), *adj.* پێداچوو یا پێدابڵاوبووەوە (شلە)؛ شلە دادەدات

**permeance** (pûr′mi-əns), *n.* پێداچوون و بڵاوبوونەوە؛ هەمووگرتنەوە.

**permeate** (pûr′mi-āt′), *v.t. & v.i.* پێداچوون و بڵاوبوونەوە؛ چوونە ناوەوە و هەمووگرتنەوە؛ پێدا بڵاوبوونەوە:
*( Water ~ing through the soil, membrane, etc.)*

**permeation** (pûr′mi-ā′shən), *n.* پێداچوون و بڵاوبوونەوە؛ چوونە ناوەوە و پێدا بڵاوبوونەوە.

**permeative** (pûr′mi-ā′iv), *adj.* توانای پێداچوون و پێدا بڵاوبوونەوە هەبوون

**per mensem** (pẽr men′səm), [L.]. مانگانە؛ مانگی؛ هەر مانگێ.

**permissibility** (pẽr-mis′ə-bil′ə-ti), *n.* هێشتن؛ ڕێ پێدران؛ شیان؛ بۆ هەبوون

**permissible** (pẽr-mis′ə-b'l), *adj.* ڕێدراو؛ هێڵراو؛ ماوە پێدراو

**permission** (pẽr-mish′ən), *n.* ڕێ پێدران؛ ماوەپێدان؛ ماوە:
*( You have my ~ to go.)*

**permissive** (pẽr-mis′iv), *adj.* (١) ڕێ پێدەر؛ ماوەپێدەر
(٢) هێڵراو؛ ڕێ پێدراو؛ قەدەغە نەکراو
(٣) بەرەڵا؛ ڕەووشت، مرۆ؛ جڵەوشلکەر؛ بەر بۆ بەرەڵاکەر.
*( a ~ society, parent, etc.)*

**-permissiveness** *(n.).*

**permit** (pẽr-mit′), *v.t.* (١) هێشتن؛ قەدەغە نەکردن:
*( Smoking is not ~ted.)*
(٢) ڕێ پێدان؛ ماوەپێدان: *( He is ~ted to leave.)*

*v.i.* دەرەتان ڕێ دان. *( I'll come if time and weather ~.)*

*n.* مۆڵەت؛ بڕوانامەی ڕێ دان.

**permutation** (pûr′myoo-tā′shən), *n.* (١) گۆڕین؛ گۆڕینی تەواو؛ ڕێکخستنەوە.
(٢) بەکێک لە شێوەکانی ڕیزە شتێکی پاش و پێش خراو

**permute** (pẽr-mūt′), *v.t.* (١) بەتەواوی گۆڕین؛ گۆڕینی یەکجاری.
(٢) ڕێکخستنەوە؛ ڕیزکردنەوە.

**pernicious** (pẽr-nish′əs), *adj.* (١) (ا) زیانبەخش؛ وێرانکەر.
(ب) کوشندە؛ بکوژ؛ پیس (نەخۆشی).
(٢) خراپ؛ ناپەسەند: *( a ~ philosophy)*.

**-perniciously** *(adv.)*; **perniciousness** *(n.).*

**pernicious anemia,** کەم خوێنیی زیانبەخش.

**pernickety** (pẽr-nik′ə-ti), *adj. Also* **persnickety.** (١) بە قێزو بێز؛ بە هیچ ڕازی نەبوو (٢) وورد (کار)؛ پێویست بە وورد و شارەزایی و ناسکی دەکات

**perorate** (per′ə-rāt′), *v.i.* (١) ووتاری دوورودرێژ خوێندنەوە.
(٢) کۆتایی هێنان بە ووتار؛ پوختەی ووتار دووپاتکردنەوە و کۆتایی پێهێنانی.

**peroration** (per′ə-rā′shən), *n.* بەشی کۆتایی ووتار (کە پوختەی ووتارەکەی تێدا دووبارە دەکرێتەوە).

**peroxide** (pẽr-ok′sīd), *n.* پێرۆکسید.

*v.t.* پێرۆکسید لێدان.

*adj.* بە پێرۆکسید سپی کراوە (قژ)

**perpend** (pûr′pənd), *n.* بەردێکی گەورەی ناو دیوارە لەم دیوو لەودیووەوە سەر دەردەهێنێ بۆ پتەوی دیوارەکە

**perpend** (pẽr-pend′), *v.t. & v.i.* [Archaic]. بیرلێکردنەوە

**perpendicular** (pûr′pən-dik′yoo-lẽr), *adj.* (١) ستوونی؛ ڕاست. (٢) یەکبڕ.
(٣) [P-]، شێوازێکی خانووسازی ئینگلیزییە بە هێڵی ستوونی ناسراوە

*n.* هێڵی ستوونی؛ هێڵی ڕاست یا وەستاو

**perpetrate** (pûr′pə-trāt′), *v.t.* کردنی کارێکی ناپەسەند؛ تاوان کردن؛ بە کارێکی خراپ هەڵسان: *( to ~ a crime)*

**-perpetration** *(n.).*

**perpetrator** (pûr′pə-trā′tẽr), *n.* تاوانکار؛ کاری ناپەسەند کەر.

**perpetual** (pẽr-pech′oo-əl), *adj.* (١) هەمیشەیی؛ هەتاهەتایی.
(٢) بەردەوام؛ هەمیشە بەردەوام. (٣) بە درێژایی وەرز گوڵ بە دەم.

*n.* ڕووەکی گوڵ بە دەم بە درێژایی وەرز (بەتایبەتی گوڵەباخ).

**perpetually** (pẽr-pech′oo-əl-i), *adv.* (١) هەمیشە؛ هەتاهەتا
(٢) بەردەوام؛ بەبێ وەستان.

**perpetuate** (pẽr-pech′oo-āt′), *v.t.* درێژەپێدان؛ هەمیشەکردن.

**-perpetuation** *(n.)*; **perpetuator** *(n.).*

**perpetuity** (pûr′pə-too′ə-ti, pûr′pə-tū′ə-ti), *n.* (١) هەتا ـ هەتایی؛ هەمیشەیی (٢) شتێکی هەمیشەیی (مووچەی خانەنشینی)

in perpetuity, هەمیشە؛ هەتاهەتا
*( to own a piece of property in perpetuity)*

**perplex** (pẽr-pleks′), *v.t.* (١) سەر لێ تێکدان؛ سەر لێ شێواندن؛ سەرسام کردن؛ حەپەساندن. (٢) ئاڵۆزان؛ ئاڵۆسکان.

**perplexed** (pẽr-plekst′), *adj.* (١) سەر لێ شێواو؛ حەپەساو؛ سەرسوڕماو؛ سەر لێ تێکچوو. (٢) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو.

**perplexing** (pẽr-plek′siŋ), *adj.* سەر لێ شێوێن؛ سەر لێ تێکدەر؛ سەرسامکەر

**perplexity** (pẽr-plek′sə-ti), *n.* (١) سەر لێ شێوان؛ شێوان؛ سەر لێ تێکچوون؛ سەرسوڕماوی (٢) شتێکی ئاڵۆز و سەرسوڕمێنەر

**perquisite** (pûr′kwə-zit), *n.* (١) سەرمووچە. (٢) بەخشیش.
(٣) مافی تایبەتی

**perron** (per′ən), *n.* پێ پلیکانەی دەرەوە (لە بەینی قەدپاڵێک و دەرگای دەرەوەی خانووبەکدا).

**perry** (per′i), *n.* خۆشاوی هەرمێ.

**per se** (pûr′ sē′), [L.]. خۆی لە خۆیدا؛ شتەکە هەر وەک خۆی و هیچی تر.

**persecute** (pûr′sə-kūt′), *v.t.* (١) چەوساندنەوە. (٢) پەستکردن.

-**persecutive** *(adj.)*; **persecutor** *(n.)*.

**persecution** (pũr´sə-kū′shən), *n.* چەوساندنەوە

**perseverance** (pũr´sə-vēr′əns), *n.* کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان؛ خۆڕاگرتن؛ بەردەوام بوون لەسەر؛ تاقەت.

**persevere** (pũr´sə-vēr′), *v.i.* کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان؛ خۆڕاگرتن؛ بەردەوام بوون لەسەر کارێکی سەخت و گران.

**persevering** (pũr´sə-vēr′iŋ), *adj.* کۆڵنەدەر؛ وازنەهێنەر؛ خۆڕاگر.

**Persia** (pũr′zhə, pũr′shə), *n.* ئێران؛ وڵاتی فارس.

**Persian** (pũr′zhən, pũr′shən), *adj.* فارسی (زمان، کلتوور، گەل)؛ ئێرانی

*n.* (١) کەسێکی فارسی یا ئێرانی. (٢) زمانی فارسی؛ فارسی

**Persian cat,** جۆرە پشیلەیەکی تووک درێژ و ئاوریشمەیییە.

**Persian Gulf,** کەنداوی فارسی

**Persian lamb,** (١) بەرخی فارسی

(٢) بەرگێنی لوول و ڕەش یا بۆری ئەم بەرخە (بۆ فەروە دروستکردن).

**Persian rug ( or carpet ),** قالی ئێرانی؛ مافوور یا فەرشی ئێرانی

**persiflage** (pũr′si-fläzh´), *n.* گاڵتە؛ لاقرتێ

**persimmon** (pēr-sim′ən), *n.* (١) جۆرە درەختێکە بەرێکی پرتەقاڵی سێریر دەگرێ ئەوەندەی قۆخێک دەبێ نامەکەی لە خورما دەچێت.

(٢) بەری ئەم درەختە

**persist** (pēr-sist′, pēr-zist′), *v.i.* (١) کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان.

(٢) لەسەر ڕۆیشتن؛ سووربوون لەسەر؛ وورێک گرتن.

(٣) بەردەوام بوون؛ دوایی نەهاتن؛ مانەوە؛ نەبڕانەوە.

**persistence** (pēr-sis′təns, pēr-zis′təns), *n.* (١) کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان (٢) لەسەر ڕۆیشتن؛ سووربوون لەسەر؛ وورێک

(٣) بەردەوام بوون؛ دوایی نەهاتن؛ نەبڕانەوە

**persistency** (pēr-sis′tən-si, pēr-zis′tən-si), *n.* persistence.

**persistent** (pēr-sis′tənt, pēr-zis′tənt), *adj.* (١) کۆڵنەدەر؛ وازنەهێنەر (٢) سوور لەسەر؛ وورێکگر

(٣) بەردەوام؛ بێ ووچان؛ نەبڕاوە *( ~ attacks)*

-**persistently** *(adv.)*.

**persnickety** (pēr-snik′ə-ti), *adj.* [Colloq.]. = pernickety.

**person** (pũr′s'n), *n.* (١) کەس؛ زەلام؛ مرۆڤ؛ ئادەمیزاد (٢) کابرا

(٣) لەش *( offences against the ~ )*

(٤) خۆ

(٥) کەس (ڕێزمان) *( the first ~ : I, we ; the second ~ : you; the third ~ : he, she, it)*

**in person,** ڕووبەڕوو؛ خۆ؛ خۆ بە خۆ

**persona** (pēr-sō′nə), *n.* (١) کەس؛ مرۆڤ؛ زەلام

(٢) (*pl.*) کەسانی چیرۆک یا شانۆنامە

**personable** (pũr′s'n-ə-b'l), *adj.* شۆخ؛ جوان؛ قۆز؛ ڕێک و پێک؛ خوو ڕەوشت جوان

**personage** (pũr′s'n-ij), *n.* (١) کەسێکی ناودار

(٢) کەس؛ مرۆڤ؛ زەلام (٣) کەسێکی ناو چیرۆک، شانۆنامە، یا مێژوویی

(٤) [Archaic] ڕووخسار

**persona grata** (pēr-sō′nə gra′tə, grä′tə), [L.], کەسێکی پەسەندکراو (بەتایبەتی دیبلۆماسی)

**personal** (pũr′s'n-əl), *adj.* (١) خۆیی؛ تایبەتی بە کەسێک؛ کەسی؛ تایبەتی؛ هی خۆ *( a ~ opinion)*

(٢) کەسی؛ خۆکرد؛ ڕوو *( a ~ interview)*

(٣) تایبەتی بە لەش و ڕووخساری خۆ *( ~ hygiene)*

(٤) (أ) دژی یا دەربارەی کەسێکی تایبەتی *( a ~ remark)*

(ب) حەزکەر لە باسکردنی کاروباری تایبەتی کەسێک (بەشێوەیەکی ناشرینانە): *( He always becomes ~ in an argument.)*

(٥) کەسی؛ لە مرۆڤ چوو؛ مرۆڤ ئاسایی: *( a ~ God)*

(٦) کەسی (ڕێزمان)؛ (٧) تایبەتی بە موڵک یا شتومەکی خۆ.

*n.* (١) دەنگوباسێکی کەسی (لە ڕۆژنامەیەکدا).

(٢) بڵاوکراوەیەک دەربارەی کاروبارێکی کەسی (لە ڕۆژنامەیەکدا)

**personal effects,** شتومەکی خۆ؛ کەلوپەلی تایبەتی بە خۆ.

**personality** (pũr´ə-nal′ə-ti), *n.* (١) کەسێتی

(٢) سەرجەم ڕەووشت و تایبەخوو سرووشتی کەسێک: *( She has ~.)*.

(٣) کەسێکی ناسراو: *( a television ~ )*.

(٤) (*pl.*)، تێبینی ناشرین یا سووک دەربارەی کەسێک.

**personalize** (pũr′s'n-əl-īz´), *v.t.* (١) تایبەتی کردن بە کەسێک؛ بەسەر خۆدا هێنان؛ ئاراستەی خۆ کردن.

(٢) لەش بەبەردا کردن؛ وەک مرۆڤ دانان.

(٣) ناوی خۆ لەسەر نووسین یا هەڵکەندن: *( ~d checks, stationery, etc.)*

**personally** (pũr′s'n-əl-i), *adv.* (١) خۆ بە خۆ؛ خۆی: *( He took care of the matter ~.)*

(٢) وەک کەسێک؛ خۆی: *( Though I dislike him ~ , I like his writings.)*

(٣) بە ڕای خۆ؛ لەلایەن خۆوە: *( P~ , I'd rather not go.)*.

(٤) وەک ئاراستەی خۆ کرابێت: *( She took his remarks ~.)*.

**personal pronoun,** ڕاناوی کەسی: ( I, me, you, we, he, she, it, they)

**personal property,** شتومەکی خۆ؛ کەلوپەلی گوازراوەی خۆ.

**persona non grata** (pēr-sōnə non gra′tə, grä′tə), [L.], کەسێکی پەسەند نەکراو؛ کەسێکی ناپەسەند یا نەویستراو (بەتایبەتی دیبلۆماسییەک لە وڵاتی بێگانەدا).

**personate** (pũr′s'n-āt´), *v.t.* (١) خۆنووانەن لە شانۆنامەدا؛ لاسایی کردنەوە

(٢) گیان بەبەرداکردنی شت (وێژە)؛ وەک ئادەمیزاد سەیرکردن.

(٣) بە درۆ خۆ کردن بە کەسێکی تر (بۆ خەڵەتاندن).

-**personation** *(n.)*; **personator** *(n.)*.

**personification** (pēr-son´ə-fi-kā′shən), *n.* (١) گیان بەبەرداکردنی شت (وێژە)؛ بە ئادەمیزاد دانان

(٢) وێنەیەکی گیان بەبەرداکردنی شت لە وێژەدا: *( Flowers danced about the lawn.)*

(٣) وێنە؛ نموونە: *( The old man was the very ~ of evil.)*

**personify** (pēr-son′ə-fī´), *v.t.* (١) وەک ئادەمیزاد سەیرکردن؛ گیان بەبەرداکردن؛ کردن بە مرۆڤ: *( We ~ a ship by referring to it as "she".)*

(٢) دەربڕینی بیرێک بە وێنەی مرۆڤ لە هونەردا.

(٣) نموونە بوون؛ نوێنەری ڕێباز یا بیروڕایەک بوون؛ نوێنەری کردن: *( He ~ied evil in the eyes of the world.)*

-**personifier** *(n.)*.

**personnel** (pũr´sə-nel′), *n.* (١) کارگەران؛ فەرمانبەران؛ سەرجەم فەرمانبەرانی دەستگایەک (٢) فەرمانگەی کارگەران؛ بەشی کاروباری فەرمانبەرانی دەستگایەک.

*adj.* تایبەتی بە بەشی کاروباری فەرمانبەران؛ هی کارگەرانی دەزگایەک

**perspective** (pēr-spek′tiv), *n.* (١) جۆرە نیگارکێشانێکە کە بەشەکانی دیمەنەکە لە سرووشتدا چۆنە وەهایش دێتە بەرچاو لەڕووی گەورەو بچووکی و دوورو نزیکی شتەکان لەیەکترییەوە (٢) وێنەیەکی وەها.

(٣) دیمەن؛ دیمەنی قووڵ و بڵاو.

(٤) پەیوەندی بەشەکانی باسێک لەگەڵ یەکتری؛ بینینی ئەم پەیوەندییە بەباشی

(٥) لا؛ ڕوو.

(٦) ڕا؛ بۆچوون؛ گۆشەی تەماشاکردن و هەڵسەنگاندن: *( He brings a fresh ~ to the debates.)*

**perspicacious** (pûr´spi-kā′shəs), *adj.* (١) ڕێ بەدیبکەر؛
باش بۆ چوو؛ هەست‌وبیرتیژ؛ ووردبین؛ پۆشنبین؛ ژیر
(٢) [Archaic] چاوتیژ.

**perspicacity** (pûr´spi-kas′ə-ti), *n.* (١) ڕێ بەدیبکردن؛
باش بۆ چوون؛ هەست‌وبیرتیژی؛ ووردبینی؛ ژیری
(٢) [Archaic] چاوتیژی.

**perspiration** (pûr´spə-rā′shən), *n.* (١) تەڕاو دەردان؛
ئارەق کردنەوە (٢) تەڕاو؛ ئارەق

**-perspiratory** *(adj.).*

**perspire** (pēr-spīr′), *v.t. & v.i.* تەڕاو دەردان؛ تەڕاو لێ نیشتن؛
ئارەق کردن؛ ئارەق دەردان.

**persuadable** (pēr-swād′ə-b'l), *adj.* ساز دەبێت؛
پێی دەسەلمێنرێ

**persuade** (pēr-swād′), *v.t.* (١) سازکردن؛ قایل کردن؛ ڕازی کردن.
(٢) پێ سەلماندن.

**persuasion** (pēr-swā′zhən), *n.* (١) قایل کردن؛ سازکردن؛ قایلی؛
قایل بوون؛ سازبوون (٢) پێ سەلماندن (٣) (ا) توانای قایل کردن
(ب) توانای پێ سەلماندن. (٤) بیروباوەڕێکی بەهێز؛ بڕوا.
(٥) ئاین؛ ڕێباز؛ ئەوانەی لەسەر هەمان ئاین یا ڕێبازن
(٦) دەستە؛ کۆمەل؛ تاقم؛ حیزب (٧) [Colloq.]. جۆر؛ چەشن؛ توخم.

**persuasive** (pēr-swā′siv), *adj.* پێ سەلمێنەر؛ سازکەر؛
*( a ~ person, reason, argument, etc.)*
*n.* [Rare]. شتی قایلکەر ـ پێ سەلمێنەر.

**-persuasively** *(adv.)*; **persuasiveness** *(n.).*

**pert** (pûrt), *adj.* (١) بێ حەیا؛ بێ ئابروو؛ چەقاوەسوو؛ ڕوو هەڵمالراو؛
ڕووقایم *( a ~ answer)*
(٢) قیت؛ زیندوو؛ چوست‌وچالاك *( a ~ old lady)*
(٣) شیك؛ ڕێك‌وپێك؛ جوان *( a ~ , little hat)*

**-pertly** *(adv.)*; **pertness** *(n.).*

**pertain** (pēr-tān′), *v.i.* (١) بەشێك بوون لە
(٢) شیان؛ لێ وەشانەوە *( the conduct that ~s to a gentleman)*.
(٣) پەیوەندی پێوە بوون *( evidence ~ing to the accident)*.
**pertaining to,** دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ لە بارەی

**pertinacious** (pûr´tə-nā′shəs), *adj.* (١) کۆڵنەدەر؛ وازنەهێنەر
(ڕێبازن بیروڕا) بە کەللەڕەقانە شوێنکەوتنی بیروڕایەك
(٢) بەردەوام؛ نەبڕاوە؛ بەگیر *( a ~ illness)*

**pertinacity** (pûr´tə-nas′ə-ti), *n.* کۆڵنەدان؛ کەللەڕەقی؛
وازنەهێنان؛ بەردەوامی

**pertinence** (pûr′t'n-əns), *n.* پەیوەندیدار؛ باس

**pertinency** (pûr′t'n-ən-si), *n.* pertinence.

**pertinent** (pûr′t'n-ənt), *adj.* پەیوەندیدار؛ باس؛
*( ~ facts, information, etc.: a ~ remark)*

**perturb** (pēr-tûrb′), *v.t.* (١) شڵەژاندن؛ ووروژاندن؛ پەستکردن؛
پەشۆکاندن؛ شەقاندن (٢) شێواندن؛ تێکدان.

**perturbation** (pûr´tēr-bā′shən), *n.* (١) (ا) شڵەژان؛ ووروژان؛
پەشۆکان؛ شەقان (ب) شێوان؛ تێکدان.
(٢) شڵەژاوی؛ پەشۆکاوی؛ تێکچوون؛ پەستی.
(٣) گۆڕان‌و تێکچوونی خولگەی ئەستێرە (بەهۆی کارێك یا هێزێکی تازەوە).

**pertussis** (pēr-tus′is), *n.* کۆکەڕەشە

**peruke** (pə-rōōk′), *n.* بارۆکە؛ کلاوقژ

**perusal** (pə-rōō′z'l), *n.* بەووردی خوێندنەوە؛ خوێندنەوەو
لێکۆڵینەوە

**peruse** (pə-rōōz′), *v.t.* (١) [Rare] بەووردی لێکۆڵینەوە؛
لێ ووردبوونەوە (٢) خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە بەووردی؛ بەووردی خوێندنەوە.
(٣) خوێندنەوە

**pervade** (pēr-vād′), *v.t.* بە هەموویدا بڵاوبوونەوە؛ هەمووگرتنەوە؛
پێدا بڵاوبوونەوە: *( A marvellous stillness ~d the city)*

**pervasion** (pēr-vā′zhən), *n.* بە هەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەوە؛
هەمووگرتنەوە.

**pervasive** (pēr-vā′siv), *adj.* بڵاوبووەوە؛ بڵاو؛ هەموو شوێنێکی
گرتووەتەوە: *( Corruption is ~ throughout the country.)*.

**-pervasiveness** *(n.).*

**perverse** (pēr-vûrs′), *adj.* (١) چەوت؛ بەدخوو؛ بەدڕەووشت؛ گومڕا.
(٢) سوور لەسەر هەڵە؛ بەردەوام لەسەر هەڵە؛ سەرسەخت.
(٣) نالەبار؛ ناپەسەند؛ دژوەستاو (٤) تەنگەجیکلانە؛ تووڕەوتڕۆ؛ قیناوی.

**perversion** (pēr-vûr′zhən, pēr-vûr′shən), *n.* (١) چەوتی؛
بەدخوویی؛ بەدڕەفتاری؛ بەدڕەووشتی (٢) نالەباری؛ ناپەسەندی.
(٣) شتێکی چەوت یا نالەبار؛ کارێکی ناپەسەند.
(٤) جووت بوونێکی نائاسایی؛ سەرسەرێتی.

**perversity** (pēr-vûr′sə-ti), *n.* (١) ناپەسەندی؛ نالەباری؛
سەرسەختی. (٢) بەدڕەووشتی؛ چەوتی؛ بەدخوویی؛ پیسی.
(٣) کارێکی ناپەسەندانە؛ کارێکی خراپ‌و بەدڕەووشتی‌یانە.

**pervert** (pēr-vûrt′), *v.t.* (١) بەدخووکردن؛ بەدڕەووشت کردن؛
لە ڕێی ڕاست لادان؛ فێری خراپە کردن. (٢) بە هەڵە بەکارهێنان؛ بە خراپ
بەکارهێنان. (٣) بە هەڵە لێکدانەوە؛ تێکدان (مانا)؛ شێواندن.
(٤) پیسکردن؛ نزم کردن؛ لە پلە کەمکردنەوە.
*n.* سەرسەری؛ کەسێکی چەوت ڕەووشت لەڕووی جووت بوونەوە؛
ڕەووشت پیس؛ چەوتڕۆ (جووت بوون).

**perverted** (pēr-vûr′tid), *adj.* (١) چەوت؛ لە ڕێی ڕاست لادەر؛
ناپەسەند. (٢) بە هەڵە لێکدراوە؛ شێوێنراو؛ تێکدراو؛ تێکچوو.
(٣) سەرسەری؛ بەدڕەووشت لەڕووی جووت بوونەوە؛ چەوتڕۆ.

**pervious** (pûr′vi-əs), *adj.* (١) ڕێی پێداچوون‌و پێدا بڵاوبوونەوە
دەدات؛ کون دەکرێ (٢) مێشك کراوە؛ کاری تێ دەکرێ (مێشك، هەڵوێست).

**pesade** (pə-sād′, pə-zād′), *n.* وەستانی ئەسپ لەسەر هەردوو
پاشووی‌و بەرزکردنەوەی دەستی بە هەوادا.

**pesky** (pes′ki), *adj.* [Colloq.]. پەستکەر؛ بێزارکەر؛ هەراسانکەر

**peso** (pā′sō), *n.* پەیسۆ: پارەی مەکسیك‌و هەندێ وولاتانی ئەمەریکای
لاتینی.

**pessary** (pes′ə-ri), *n.* (١) شانی زێ؛ دەستووری زێ
(٢) شتێکە دەخرێتە زێوە بۆ منداڵ نەبوون یا ڕاگرتنی زێی لەجێ چوو

**pessimism** (pes′ə-miz'm), *n.* (١) (ا) بیروباوەڕێکە کە دەڵێت:
ئەم جیهانە خراپترین‌و ناپەسەندترین جیهانە. (ب) بیروباوەڕێکە کە دەڵێت
هێزی خراپەکاری لە هێزی چاکەکاری بەهێزترە. (٢) ڕەشبینی؛ بەدبینی؛
بەرچاوتاریکی

**pessimist** (pes′ə-mist), *n.* کەسێکی ڕەشبین، بەدبین. یا
بەرچاوتاریك.

**pessimistic** (pes´ə-mis′tik), *adj.* ڕەشبین؛ بەدبین؛ بەرچاوتاریك

**-pessimistically** *(adv.).*

**pest** (pest), *n.* (١) جانەوەری زیانبەخش.
(٢) کەسێك یا شتێکی پەستکەرو زیانبەخش‌و ناپەسەند.
(٣) [Rare]. تاعوون؛ دەردی پیس.

**pester** (pes′tēr), *v.t.* سەرکونکردن؛ سەرکردنەسەر؛ هەراسان کردن؛
بێزارکردن؛ پەستکردن: *( She kept ~ing me for money.;*
*Flies ~ed us in the daytime and mosquitoes at night.)*

**pesthole** (pest′hōl´), *n.* شوێنی پیسی‌و دەرد تێداکەوتنەوە

**pesthouse** (pest′hous´), *n.* [Archaic]. نەخۆشخانەی دەردی
تێپەڕ؛ نەخۆشخانەی درم‌و دەردی پیسی زوو بڵاوبووەوە (بۆ دابڕینی)

**pesticide** (pes′tə-sīd´), *n.* دەرمانی جانەوەرکوژ؛ مێرووکوژە

**pestiferous** (pes-tif′ēr-əs), *adj.* (١) نەخۆشی هەڵگر؛
نەخۆشی خەردوە. (٢) دەردەدار؛ درماوی (٣) ڕەووشت پیسکەر؛ پیس؛

زیانبەخش بە کۆمەڵگ، بەد؛ ناپەسەند. (٤) [Colloq.]، پەستکەر؛ ناخۆش؛ بێزارکەر

**pestilence** (pes′tə-ləns), *n.* (١) دەردی کاری؛ دەردی پیس؛ تاعوون
(٢) دەردکەوتنەوە. (٣) شتێکی زیانبەخش و پیس و ناپەسەند (بیروڕا، ڕێباز).

**pestilent** (pes′tə-lənt), *adj.* (١) کوشندە، بکوژ
(٢) [Rare] درمی؛ تێپەڕ (دەرد). (ب) درم خەرەوە؛ دەردخەرەوە.
(٣) ڕەووشت پیسکەر؛ زیانبەخش بە کۆمەڵگا؛ بەد
(٤) پەستکەر؛ ناخۆش؛ بێزارکەر؛ ناپەسەند

-pestilential *(adj.)*.

**pestle** (pes′'l, pes′t'l), *n.* (١) دەسکی دەسکەوان؛ دەسکی دزل.
(٢) کوتك

*v.t. & v.i.* هارین.

**pet** (pet), *n.* (١) گیانداری ناومال کە بۆ خۆشی بەخێوەکریٚ نەك بۆ سوود (سەگ، پشیلە، باڵندە... هتد)؛ گیانداری خانەکی (٢) کەسێکی خۆشەویست و نازکێشراو (بەتایبەتی کە بکرێ بە دەسکەلا): *( a teacher's ~ )*.
(٣) شتێکی خۆش ویستراو

*adj.* (١) خانەکی و بۆ خۆشی بەخێوکراو: *( a ~ duck)*.
(٢) خۆشەویست، زۆر خۆش ویستراو
(٣) تایبەتی، نموونە، لەرووی گاڵتەوە؛ ئێجگار

*v.t.* (١) [Rare] وەك گیانداری خانەکی سەیرکردن.
(٢) دەست پێداهێنان، یاری پێکردن: *( to ~ a child, horse, dog, etc.)*.

*v.i.* [Colloq.], دەستبازی کردن؛ باوەش پێداکردن و ماچ و مووچ کردن؛ ماچ و مووچ کردن

**pet** (pet), *n.* مڕومۆنی، ڕووگرژی، دەموچاوترشی؛ پێش خواردنەوە
*v.i.* مڕومۆنی کردن، ڕووگرژکردن؛ پێش خواردنەوە.

**petal** (pet′'l), *n.* پەڕەی گوڵ.

**petaloid** (pet′'l-oid′), *adj.* لە پەڕەی گوڵ دەچێت

**petalous** (pet′'l-əs), *adj.* پەڕەی گوڵدار؛ پەڕەدار

**petard** (pi-tärd′), *n.* (١) بۆمبایەکی فووچەکی کۆنە دیوار و دەرگای پێ دەرووخێنراو دەکرایەوە. (٢) دەمەرقاچان

hoist with one's own petard, بە داوی خۆوە بوون؛ تووشی داوی خۆ بوون و لەناوچوون.

**petasos, petasus** (pet′ə-səs), *n.* جۆرە تەپلەیەکی قەراغ پانی سەر پانی کۆنی یۆنانیەکانە.

**petcock** (pet′kok′), *n. Also* pet cock, دەمەوانە، تزیەوانە

**petiolate** (pet′i-ə-lāt′), *adj.* لاسکدار (ڕووەکناسی، زیندەوەرناسی)

**petiole** (pet′i-ōl′), *n.* ئەندامی لاسکیی نێوان قەفەزەی سنگ و سکی هەندێ جانەوەر

**petit** (pet′i), *adj.* بچووك (دادگەری)؛ ناسەرەکی (ووشەی دوایی ببینە)

**petite** (pə-tēt′), *adj.* خنجیلانە (نافرەت)؛ بچووك و باریکەلە؛ خنجیلە

**petition** (pə-tish′ən), *n.* (١) سکالانامە (٢) خواست

*v.t.* (١) سکالانامە پێشکەش کردن (٢) داواکردن؛ تکاکردن.

*v.i.* داواکردن

**petitioner** (pə-tish′ən-ẽr), *n.* داواکار؛ خاوەن سکالانامە.

**petit jury,** دەستەی سوێندخۆران (کە لە دوانزە کەس پێکدێت و بریار لەسەر داوا دەدات لە دادگادا)

**petit larceny,** = petty larceny.

**petit mal** (pə-tē′ mäl′), [Fr.], فێی سووك

**petit point,** تەقەڵی بچووك

**pet name,** نازناو؛ ناوێکە نە خۆشەویستیدا لە کەسێك دەنرێ؛ ناوی خۆشەویستی

**petrifaction** (pet′rə-fak′shən), *n.* (١) بوون بە بەرد؛ وەك بەرد لێهاتن، کردن بە بەرد؛ ڕەق بوون (٢) زۆر ترسان؛ زارەترەك کردن؛ کاس بوون لە ترسدا؛ واق ووڕمان (٣) شتێکی وەك بەرد لێهاتوو.

**petrification** (pet′rə-fi-kā′shən), *n.* = petrifaction.

**petrify** (pet′rə-fī′), *v.t.* (١) کردن بە بەرد؛ وەك بەرد لێکردن.
(٢) ڕەق کردن؛ مراندن. (٣) سڕکردن لە ترسدا؛ زۆر ترساندن؛ زارەترەك کردن؛ ووڕکردن لە ترسدا؛ واق ووڕمان.

*v.i.* بوون بە بەرد؛ وەك بەرد لێهاتن

**petro-** (pet′rə), پێشگرێکە بەمانای: بەرد.

**petrochemical** (pet′rə-kem′i-k'l), *n.* ماددەیەکی کیمیایی لە پەترۆڵ وەرگیراو.

*adj.* پەترۆکیمیایی

**petroglyph** (pet′rə-glif′), *n.* نەخشی سەر بەرد (هی زۆر کۆن).

**petroglyphy** (pi-trog′lə-fi), *n.* هونەری نەخش هەڵکەندن لەسەر بەرد.

**petrographer** (pi-trog′rə-fẽr), *n.* زانای بەرد؛ بەردناس.

**petrography** (pi-trog′rə-fi), *n.* بەردناسی؛ زانستی نیشانەکردن و پۆل پۆل کردنی بەرد

**petrol** (pet′rəl), *n.* [British], = gasoline.

**petroleum** (pə-trō′li-əm), *n.* پەترۆڵ؛ نەوت؛ نەوت و بەنزین

**petrology** (pi-trol′ə-ji), *n.* زانستی پێکهاتنی بەرد و بنچینەکانی؛ بەردناسی.

-petrologic *(adj.)*; petrological *(adj.)*; petrologist *(n.)*.

**petronel** (pet′rə-nəl), *n.* جۆرە تفەنگێکی کۆنە (سەدەی ١٥ تا ١٧).

**petrosal** (pi-trō′s'l), *adj.* (١) بەردین؛ زۆر ڕەق.
(٢) تایبەتی بەو ئێسقانەی لای کاسەی سەرە کە دەوری گوێی ناوەوە دەدات و دەیپارێزێ.

**petrous** (pet′rəs, pē′trəs), *adj.* = petrosal.

**petticoat** (pet′i-kōt′), *n.* (١) ژێرکراس. (٢) شتێکی وەك ژێرکراس.
(٣) [Colloq.]، نافرەت؛ کچ؛ ژن

*adj.* (١) مێچکانە؛ ژنانە؛ کچانە؛ ناسك
(٢) هی ژنان؛ هی ژن؛ ژن دەیبات بەڕێوە: *( a ~ government)*.

**petticoat government,** فەرمانڕەوایی ژن.

**pettifog** (pet′i-fog′, pet′i-fôg′), *v.i.* داواکاری هیچ و پووچ گرتنەدەست و بە سەرچەوتانە و بێ ویژدانانە کارکردن (پارێزەر).

**pettifogger** (pet′i-fog′ẽr, pet′i-fôg′ẽr), *n.* پارێزەرێکی سەرچەوت و بێ ویژدانە کە داوای هیچ و پووچ دەگرێتە دەست.

-pettifoggery *(n.)*.

**pettiness** (pet′i-nis), *n.* هیچ و پووچی؛ بێ نرخی؛ شتی بچووك گەورەکردن و گیروگرفت دروستکردن؛ زۆر گوێدان بە شتی هیچ و پووچ

**pettish** (pet′ish), *adj.* تووڕەوترزۆ؛ تەنگەجیکلانە؛ ووڕکگر؛ قینناوی

**pettitoes** (pet′i-tōz′), *n.pl.* (١) پاچەی قاچی بەراز؛ قاچ و قولی بەراز بە کولاوی. (٢) قاچ و قولی منداڵ.

**petty** (pet′i), *adj.* (١) هیچ و پووچ؛ ناگرنگ؛ کەم؛ بچووك: *( ~ grievances)*
(٢) مێشك تەسك: *( a ~ outlook)*.
(٣) [Colloq.]، نزم؛ ووڕکگر لە شتی بچووك و هیچ و پووچ؛ بەکینە؛ ناپەسەند
(٤) بچووك (فەرمانبەر)؛ پلە نزم؛ ناسەرەکی: *( a ~ official)*.

-pettily *(adv.)*.

**petty cash,** دەغیلە بچکۆلە: هەندێ پارەی کەمە دەخرێتە لاوە بۆ خەرج کردن لەسەر شتی ناکاو و ناگرنگ.

**petty jury,** = petit jury.

**petty larceny,** *Also* petit larceny, دزیی بچووك

**petty officer,** دەستیاری ئەفسەر (هێزی دەریایی).

**petulance** (pech′oo-ləns), *n.* تەنگەجیکلانەیی؛ بێ ئارامی؛ زوو هەڵچوون؛ تووڕەوترزۆیی

**petulancy** (pech′oo-lən-si), *n.* petulance.

**petulant** (pech′oo-lənt), *adj.* (١) [Obs.]، (ا) ڕووقایم؛ بێ شەرم (ب) بێ حەیا؛ بێ نەزاکەت (٢) تەنگەجیکلانە؛ تووڕەوترزۆ؛ زوو هەڵچوو

**petunia** (pə-tōōn′yə, pə-tū′ni-ə), *n.* (١) پاتۆنیا: ڕووەکێکە
گوڵی ڕەنگاوڕەنگی دەم پانی وەك ڕەحەتی دەگری. (٢) گوڵە پاتۆنیا.

**pew** (pū), *n.* (١) (ا) تەختە یا کورسی درێژی پشت داری کڵێسە
(ب) ڕیزە تەختە یا کورسی درێژی پشت داری کڵێسە.
(٢) لۆجی کڵێسە (بەتایبەتی لە کۆندا).

**pewee** (pē′wē), *n.* باڵندەیەکی بچووکی مێشخۆرە

**pewit** (pē′wit, pū′it), *n.* (١) pewee.
(٢) زیقاوڵە: باڵندەیەکی قەراغ ئاوە.

**pewter** (pū′tēr), *n.* (١) پیوتەر: داڕشتەیەکە لە قەڵایی و زەرد یا مس
پێکدێت ڕەنگێکی زیوی هەیە. (٢) دەفری لەم داڕشتەیە درووستکراو.

**peyote, peyoti** (pā-ō′ti), *n.* (١) پایۆت: ماددەیەکی سڕکەرە لە
توخمی بەنگ. (٢) جۆرە ڕووەکێکی بیابانە ئەم جۆرە بەنگەی لێ دەردەهێنرێ.

**pfennig** (fen′ig), *n.* فێنیگ: پارەیەکی ئەڵمانییە بریتییە لە سەدیەکی
" مارك ". نك: فلسی ئەڵمانی.

**phaeton** (fā′ə-t′n), *n.* (١) گالیسکەیەکی جوارپێچکەیی دوونەسپیی
سەرکراوەیە. (٢) جۆرە ئوتومبێلێکی سەرکراوەیە.

**-phage** (fāj), پاشگرێکە بەمانای: بخۆر؛ فەوتێنەر؛ لەناوبەر.

**phagocyte** (fag′ə-sīt′), *n.* خڕۆکەی سپییە کە بەکتریاو زیندەوەری
بچووکی بێگانەی ناو خوێن و ڕیشاڵی لەش قووت دەدات و دەفەوتێنێ.

**phagocytosis** (fag′ə-sī-tō′sis), *n.* قووتدان و فەوتاندنی بەکتریاو
زیندەوەری بچووکی بێگانەی ناو خوێن و ڕیشاڵی لەش لەلایەن خڕۆکەی
سپییەوە

**-phagous** (fə-gəs), پاشگرێکە بەمانای: بخۆر.

**-phagy** (fə-ji), پاشگرێکە بەمانای: خواردن

**phalange** (fal′ənj, fə-lanj′), *n.* ئێسقانی پەنجەی دەست و قاچ.
(پێنشی دەووتریّ " phalanx ").

**phalanger** (fə-lan′jēr), *n.* گیاندارێکی ئوستورالی بچووکی
توورەکەداری کلك درێژی تووك نەرم و درێژە لەناو درەختدا دەژی.

**phalanstery** (fal′ən-ster′i), *n.* (١) کۆمەڵگایەکی هاوبەشی
هەرەوەزییە. (٢) خانووی کۆمەڵگایەکی وەها.

**phalanx** (fā′laŋks, fal′əŋks), *n.* (١) دەستە ئەشکر؛ تابوور.
(٢) کۆمەڵێك خەڵکی هاوئامانج؛ کۆمەڵەیەکی ڕێکخراو. (٣) phalanstery.
(٤) ئێسقانی پەنجەی دەست و قاچ (پێنشی دەووترێ " phalange ").

**phalarope** (fal′ə-rōp′), *n.* باڵندەیەکی قەراغ ئاوو ئاوئاوی بچووکە.

**phallic** (fal′ik), *adj.* (١) کێری؛ هی کێر
(٢) تایبەتی بە کێر پەرستن (کێر وەك نیشانەی زاووزێ): *( ~ worship)*.

**phallus** (fal′əs), *n.* (١) (ا) کێر (ب) ئەو ڕیشاڵانەی ئاوڵەمەیە کە
گەورەبوون دەبنە کێر یا قیتکە. (٢) شێوەی کێر (کە دەپەرسترا وەك نیشانەی
زاووزێ لە یۆنانی کۆندا). (٣) کێر لەکاتی منداڵیدا (دەروونناسی).

**phantasm** (fan′taz′m), *n.* (١) تارمایی؛ خێو
(٢) لەیەکچوونێکی ڕووکەشی یا درۆزنە.
(٣) شێوەی شتێکی ڕاستەقینە لە مێشکدا.

**phantasma** (fan-taz′mə), *n.* تارمایی؛ خێو

**phantasmagoria** (fan-taz′mə-gôr′i-ə, fan′taz-mə-gō′-ri-ə), *n. Also* **phantasmagory**, (١) شێوەی سەیر سەیرو هەمیشە
گۆڕاوی وەك لە خەوو ووڕێنەکردندا بینراو. (٢) پیشاندانێکی وێنەو شێوەی
سەیرو هەمیشە گۆڕاو؛ دیمەنێکی هەمیشە گۆڕاو.

**phantasmal** (fan-taz′m′l), *adj.* هی تارمایی؛ خێوی؛ درۆزنە؛
نادیار؛ خەیاڵی

**phantasy** (fan′tə-si, fan′tə-zi), *n.* **fantasy.**

**phantom** (fan′təm), *n. Also* **fantom**, (١) تارمایی؛ خێو؛
شەبەنگ. (٢) شتێکە کە هەر لە مێشکدا هەبێ؛ شتێکە کە لە ڕاستیدا بوونی
نەبێت، بەڵام لە مێشك و خەیاڵدا بێت؛ خەیاڵە درۆزنە.
*adj.* شەبەنگی؛ لە تارمایی چوو: *( a ~ ship)*.

**Pharaoh** (fâr′ō), *n.* (١) فیرعەون: پادشای میسری کۆن
(٢) زۆردار؛ فەرمانڕەوای زاڵم؛ ستەمکار.

**pharaoh ant,** مێروولەیەکی سووری زۆر بچکۆلەیە

**Pharisaic** (far′ə-sā′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە " فەریسی " یەکان
(دووەم ووشەی دوای ئەمە ببینە). (٢) [p-]: دووڕوو؛ دووزمان؛ بە سەرزاری
پاك و بەئاین و دڵسۆز، بەڵام لە ژێرەوەیش ساختەچی.
-**pharisaical** ***(adj.)***; **pharisaically** ***(adv.)***.

**Pharisaism** (far′ə-sā-iz′m), *n.* (١) بیروباوەڕو کرداری
" فەریسی " یەکان (ووشەی داهاتوو ببینە). (٢) [p-]: دووڕوویی؛ دووزمانی؛
بە سەرزاری پاکی و بەئاینی و دڵسۆزی و لە ژێرەوەیش ساختەچێتی

**Pharisee** (far′ə-sē′), *n.* (١) ئەندامی کۆمەڵێکی ئاینی جوولەکەی
کۆن بوو بە کوێرانەو توندوتیژی فەرمانی مووسایی و ئاینییان لێکدەدایەوە.
(٢) [p-]: کەسێکی بە سەرزاری پاك و بەئاین و دڵسۆز، بەڵام لە ژێرەوە
سەرچەوت و ساختەچی؛ دووڕوو؛ دووزمان.

**pharmaceutic** (fär′mə-sōō′tik, fär′mə-sū′tik), *adj.* = **pharmaceutical.**

**pharmaceutical** (fär′mə-sōō′ti-k′l, fär′mə-sū′ti-k′l),
*adj.* (١) هی دەرمانگەری و دەرمانگەراز؛ هی دەرمانسازی. (٢) هی دەرمان.
*n.* دەرمانی گیراوە؛ دەرمان.

**pharmaceutics** (fär′mə-sōō′tiks, fär′mə-sū′tiks), ***n.pl.***
زانستی دەرمانگەری؛ دەرمانسازی.

**pharmaceutist** (fär′mə-sōō′tist, fär′mə-sū′tist), *n.* = **pharmacist.**

**pharmacist** (fär′mə-sist), *n.* دەرمانگەر؛ دەرمانساز؛ دەرمانفرۆش.

**pharmacological** (fär′mə-kə-loj′i-k′l), *adj.* تایبەتی بە
زانستی دەرمان

**pharmacologist** (fär′mə-kol′ə-jist), *n.* دەرماننناس؛
زانای دەرمان و پێکهاتن و گرتنەوەو کارکردنی.

**pharmacology** (fär′mə-kol′ə-ji), *n.* زانستی دەرمان؛
زانستی دەرمان و پێکهاتن و گرتنەوەو کارکردنی؛ دەرمانگەری.

**pharmacopoeia** (fär′mə-kə-pē′ə), *n.* (١) کتێبی لیستە
دەرمان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان؛ پەڕتووکی دەرمانسازی. (٢) کۆمەڵە دەرماز

**pharmacy** (fär′mə-si), *n.* (١) دەرمانگەری؛ دەرمانسازی؛
پیشەی دەرمانگەری؛ زانیاری دەرمانگەری. (٢) دەرمانخانە.

**pharyngal** (fə-riŋ′g′l), *adj.* **pharyngeal.**

**pharyngeal** (fə-rin′ji-əl, far′in-jē′əl), *adj.* تایبەتی بە قوڕگ؛
گەروویی

**pharyngitis** (far′in-jī′tis), *n.* هەوکردنی قوڕگ؛ قوڕگ ئێشە؛
ئاوسانی گەروو.

**pharygo-** (fə-riŋ′gō, fə-riŋ′gə), پێشگرێکە بەمانای: قوڕگ؛
گەروو.

**pharyngology** (far′iŋ-gol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی قوڕگ؛
زانستی قوڕگ و نەخۆشییەکانی.

**pharyngoscope** (fə-riŋ′gə-skōp′), *n.* ئامێری تێڕوانین یا
پشکنینی قوڕگ (پزیشکەوانی).

**pharyngotomy** (far′iŋ-got′ə-mi), *n.* نەشتەرگەری قوڕگ.

**pharynx** (far′iŋks), *n.* قوڕگ؛ گەروو؛ بینەقاقا.

**phase** (fāz), *n.* (١) شێوەیەك لە شێوەکانی مانگ یا ئەستێرەی گەڕۆك.
(٢) باری گۆڕین؛ بار؛ دۆخ؛ پلە؛ قۆناغ
*( a youthful ~ ; a ~ of history)*
(٣) ڕوو؛ بار؛ لا؛ بەش: *( This is but one ~ of the subject.)*.
(٤) شێوە (کیمیا).
(٥) یەکێك لە دۆخ یا بارەکانی گۆڕینی زیندەوەر.
*v.t.* بە پلەپلەکردن یا هێنانە پێشەوە؛ بە قۆناغ قۆناغ کردن یا بەجێهێنان
**phase in,** بە پلەپلەکردن؛ بە قۆناغ قۆناغ جێبەجێکردن یا پێشکەش کردن.
**phase out,** ووردە ووردە دوایی پێ هێنان؛ بەرەبەرە کۆتایی پێ هێنان.

**-phasia** (fā'zhə, fā'zhi-ə), پاشگرێکە بەمانای ناتەواوی یا کەموکووڕی قسەکردن

**Ph.D.**, = Philosophiae Doctor - Doctor or Philosophy.

**pheasant** (fez''nt), *n.* قرقاول؛ باڵندەیەکی جوانی ڕەنگاوڕەنگی کلك درێژە ئەوەندەی کەڵەشێرێکی گەورە دەبێ.

**phelloderm** (fel'ə-dûrm'), *n.* چینە شانەی سەوزو نەرمی دیوی ناوەوەی توێکڵەدارە

**phellogen** (fel'ə-jən), *n.* ئەو شانە یا ڕیشاڵانەی کە دیوی ناوەوەی توێکڵە داریان لێ درووست دەبێ.

**phen-**, پێشگرێکە بەمانای: لە بەنزین درووستکراو؛ بەنزینی.

**phenix** (fē'niks), *n.* = phoenix.

**pheno-** (fē'nō, fen'ə), = phen-.

**phenol** (fē'nôl, fē'nol, fē'nōl), *n.* فینۆل؛ ترشی کاربۆلیك؛ ئەسفەنیك

**phenolic** (fi-nol'ik, fi-nō'lik), *adj.* فینۆلی؛ ئەسفەنیکی.

**phenology** (fi-nol'ə-ji), *n.* فینۆلۆجیا: زانستی لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان ئاو وهەواو گۆڕینی وەرزەکان و دیاردەی زیندەوەری وەك گوڵ کردن و ئاووزێ و کۆچ کردنی باڵندەو زیندەوەری تر.

-phenological *(adj.)*.

**phenomena** (fi-nom'ə-nə), *n. plural of* phenomenon.

**phenomenal** (fi-nom'ə-n'l), *adj.* (١) تایبەتی بە دیاردە؛ دیاردەیی (٢) سەرناسا؛ ئێجگار زۆر؛ زۆر؛ نائاسا و چاوەڕوان نەکراو:
*( Her recovery from the car accident was ~ .)*
(٣) لەرێی یەکێك لە هەستەکانەوە پێ زانراو.

**phenomenalism** (fi-nom'ə-n'l-iz'm), *n.* بیروڕایەکی فەلسەفی‌یە دەڵێت: کە تەنها دیاردە دەزانرێت و لە دیاردەش بەولاوە هیچ شتێك ڕاستێتی نی‌یەو نایشزانرێ.

-phenomenalistic *(adj.)*.

**phenomenology** (fi-nom'ə-nol'ə-ji), *n.* (١) دیاردەناسی؛ زانستی دیاردە (٢) زانستی نیشانە هەڵدان و پۆل پۆل کردنی دیاردە بەبێ لێکدانەوەی

-phenomenological *(adj.)*; phenomenologist *(n.)*.

**phenomenon** (fi-nom'ə-non'), *n.* (١) ڕووداوێکی سرووشتی؛ دیاردە؛ شتێك یا ڕووداوێکی دیارو لەڕوو:
*( An eclipse is a ~ of astronomy.)*
(٢) ڕواڵەت؛ ڕووخسار؛ ڕووکەشی شتێك نەك ڕاستی‌یەکەی
(٣) ڕووداوێکی سەرناسا؛ شتێکی نائاسا.
(٤) [Colloq.] کەسێکی بلیمەت؛ کەسێکی زۆر لێهاتوو؛ یەکێکی هەڵکەوتوو

**phenotype** (fē'nə-tip'), *n.* (١) تایبەخۆی دیاری توخمێك لە گیانەوەر کە لە دەوروبەرەوە پەیدابووبێ نەك لە بنەچەوە بۆی مابێتەوە
(٢) هەموو ئەندامانی توخمێکی وەها

**phew** (fū, fyoo), *interj.* فیو!؛ دەنگێکە سەرسامی، وەڕسی، یا ناسوودەیی دەردەبڕێت.

**phial** (fī'əl), *n.* شووشەی بچووك؛ بوتڵی بچووك

**philander** (fi-lan'dēr), *n.* [Rare]. = philanderer.
*v.i.* داوێن پیسی کردن؛ دڵداری و داوێن پیسی کردن بە لامسەرلایی‌یەوە.

**philanderer** (fi-lan'dēr-ēr), *n.* پیاوی داوێن پیس؛ سەرسەری؛ دڵداری لامسەرلایی؛ پیاوێکە کە هەر خەریکی داوێن پیسی و دڵداری بێباکانەیە.

**philanthropic** (fil'ən-throp'ik), *adj.* هی خێرەومەندی؛ خێرخوازی؛ خێری؛ دەستگیرۆیی: *( a ~ organization)*

-philanthropical *(adj.)*.

**philanthropist** (fi-lan'thrə-pist), *n.* خێرەومەند؛ بەخشندە؛ چاکەکەر؛ مرۆڤ دۆست.

**philanthropy** (fi-lan'thrə-pi), *n.* (١) خێرەومەندی؛ خێرخوازی؛ چاکەکردن بۆ ئادەمیزاد؛ مرۆڤ دۆستی.
(٢) پرۆژەی چاکە یا خێرەومەندی؛ کاری خێرخوازانە

**philately** (fi-lat''l-i), *n.* پووڵی پۆستە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەیان.

**-phile** (fil, fīl), پاشگرێکە بەمانای: خۆشویستن؛ بەدڵ بوون؛ ویستن.

**philharmonic** (fil'ēr-mon'ik), *adj.* (١) مۆسیقاخواز؛ حەز لە مۆسیقا کەر. (٢) تایبەتی بە کۆمەڵەیەکی مۆسیقاخواز یا ئۆرکێسترا.
*n.* (١) [P-]، کۆمەڵەی مۆسیقاخواز؛ کۆمەڵەی سەرپەرشتیکەری ئۆرکێسترا
(٢) [P-]، [Colloq.]، ئۆرکێسترا؛ ئاهەنگی مۆسیقا.

**philhellene** (fil-hel'ēn), *n.* کەسێکی سەر بە یۆنان و گەلەکەی؛ یۆنان خواز.

**philhellenic** (fil'he-len'ik, fil'he-lē'nik), *adj.* یۆنان خواز؛ سەر بە یۆنان و گەلەکەی.

**philhellenism** (fil-hel'ən-iz'm), *n.* سەر بە یۆنانی؛ یۆنانچێتی؛ لایەنگری کردنی یۆنان و گەلەکەی؛ یۆنان خوازێتی.

-philhellenist *(n.)*.

**-philia** (fil'i-ə), پاشگرێکە بەمانای: (أ) مەیلی بۆ هەیە: *( hemophilia)*
(ب) زۆر حەزلێکردن؛ بەشێوەیەکی نائاسایی ویستن: *( necrophilia)*

**Philistine** (fə-lis'tin, fil'əs-tēn', fil'əs-tīn'), *n.* (١) فەلەستین (کۆن). (٢) کەسێکی نەزانی پارەپەرستی مێشك تەسکی گوێ بە کلتوورو جوانی و هونەر نەدەر
*adj.* (١) تایبەتی بە فەلەستینی کۆن. (٢) پارەپەرست و کۆنەپەرست و هیچ نەزان و مێشك تەسك و گوێ بە کلتوورو جوانی و هونەر نەدەر.

**Philistinism** (fə-lis'tin-iz'm, fil'əs-tin-iz'm), *n.* هیچ نەزانی و مێشك تەسکی و پارەپەرستی و کۆنەپەرستی و گوێ نەدان بە کلتوورو جوانی و هونەر.

**philo-** (fil'ō, fil'ə), پێشگرێکە بەمانای: حەزلێکردن؛ دڵ پێوەبوون؛ ویستن؛ مەیل بۆ هەبوون (بۆ لێکۆڵینەوە): *( philosophy, philology)*.

**philogyny** (fi-loj'ə-ni), *n.* ئافرەت خۆشویستن؛ ئافرەت پەرستی؛ ژن خۆشویستن.

**philologer** (fi-lol'ə-jēr), *n.* = philologist.

**philologian** (fil'ə-lō'ji-ən, fil'ə-lō'jən), *n.* = philologist.

**philological** (fil'ə-loj'i-k'l), *adj.* فیلۆلۆجی؛ تایبەت بە زمانەوانی.

**philologist** (fi-lol'ə-jist), *n.* زمانەوان؛ زانای زمان.

**philology** (fi-lol'ə-ji), *n.* (١) حەزکردن لە خوێندن و وێژە. (٢) لێکۆڵینەوەی وێژەی کۆن یا کلاسیکی. (٣) فیلۆلۆجی؛ زمانەوانی.

**philomel** (fil'ə-mel'), *n.* [Poetic], بولبول.

**philoprogenetive** (fil'ə-prō-jen'ə-tiv), *adj.* (١) منداڵی زۆر بووە؛ منداڵی زۆر هەیە. (٢) منداڵی خۆ خۆشویست؛ منداڵی خۆ پەرست
(٣) تایبەتی بەم خۆشەویستی‌یە

**philosopher** (fi-los'ə-fēr), *n.* (١) فەیلەسوف. (٢) کەسێکە کە خۆشی و ناخۆشی کاری تێ ناکات؛ کەسێکە کە هات و نەهات بە ژیری و هێمنی وەردەگرێ. (٣) [Obs.]. alchemist.

**philosophers' ( or philosopher's ) stone,** بەردی فەیلەسوفان؛ بەردی بێ مەرگی.

**philosophic** (fil'ə-sof'ik), *adj.* (١) فەلسەفی؛ تایبەت بە فەلسەفە. (٢) ژیر؛ هێمن؛ بەجەرگ و خۆڕاگر لە نەهاتیدا.

**philosophical** (fil'ə-sof'i-k'l), *adj.* = philosophic.

**philosophize** (fi-los'ə-fīz'), *v.i.* فەلسەفەکردن؛ وەك فەیلەسوف بیرکردنەوەو قسەکردن.

**philosophy** (fi-los'ə-fi), *n.* (١) حەزکردن لە ژیری و زانین یا زانست. (٢) فەلسەفە؛ لێکۆڵینەوەی بنچینەکانی ڕاستی و بیرکردنەوەو ژیان و ڕەووشت و یاساکانی ژیان و جیهان و زانیاری
(٣) بنچینەو یاساکانی بەشێك لە بەشەکانی زانیاری یا ژیان:
*( the ~ of education; the ~ of a culture)*
(٤) هەموو بەشەکانی زانیاری زانکۆ جگە لە پزیشکەوانی و یاساناسی و ئاین

***( Doctor of ~ )***

(٥) را؛ تیۆری؛ بیروباوەڕی بنچینەیی.

(٦) لێکۆڵینەوەی ڕەووشت و ڕەفتاری مرۆڤ.

(٧) ژیری؛ هێمنی.

**philter, philtre** (fil′tẽr), ***n.*** (١) خواردنەوە یا نوشتەی دڵداری؛ خواردنەوەیەك یا نوشتەیەکە گوایە وا لە مرۆڤ دەکات بکەوێتە دڵدارییەوە.

(٢) خواردنەوەیەکی ئەفسوونەیی.

***v.t.*** نوشتەلێکردن؛ خواردنەوەی ئەفسوونی دڵدارێتی خستنە دڵەوە.

**phiz** (fiz), ***n.*** [Slang], ڕووخسار؛ دەموچاو.

**phlebitis** (fli-bī′tis), ***n.*** هەوکردنی خوێنهێنەر؛ ئاوسانی دەماری خوێن

**phlebo-** (fleb′ō, fleb′ə), ***Also*** **phleb-**, پێشگرێکە بەمانای: خوێنهێنەر؛ دەزوولەی خوێن؛ دەماری خوێن.

**phlebosclerosis** (fleb′ō-skli-rō′sis), ***n.*** ڕەق بوونی دیواری دەماری خوێن

**phlebotomy** (fli-bot′ə-mi), ***n.*** دەماری خوێن هەڵدرین و خوێن بەردان بۆ چارەکردنی نەخۆشی.

**phlegm** (flem), ***n.*** (١) بەڵغەم. (٢) یەکێکە لەو چوار شلەیەی لەشی لێ پێکدێت و لە کۆندا وا بڕوابوو کە دەبێتە هۆی سستی و تەمەڵی.

(٣) (ا) سستی؛ تەمەڵی؛ بێ باکی؛ بێ تاقەتی. (ب) هێمنی؛ لەسەرخۆیی.

**phlegmatic** (fleg-mat′ik), ***adj.*** (١) خاو؛ سست؛ تەمەڵ.

(٢) لەسەرخۆ؛ هێمن؛ نەبزۆك؛ هیچ کارتێنەکەر.

**phlegmy** (flem′i), ***adj.*** (١) بەڵغەمی؛ بەڵغەماوی؛ بەبەڵغەم

(٢) [Rare]، phlegmatic.

**phloem** (flō′em), ***n.*** تونکی نەرمی لاسك یا قەدی ڕووەك (کە خواردەمەنی لێوە دێت و دەچێ).

**phlogistic** (flō-jis′tik), ***adj.*** (١) تایبەت بە بنچینەی ئاگرو سووتان.

(٢) [Obs.]، گراوی؛ گرگرتوو؛ داگیرساو

(٣) هی هەوکردن؛ هی ئاوسان یا داگیرسان (پزیشکەوانی).

**phlogiston** (flō-jis′ton, flō-jis′tən), ***n.*** بنچینەی ئاگر؛ ماددەیەکە لە کۆندا وا دەزانرا کە دەبێتە هۆی ئاگر داگیرسان و لە ئاگریش دەبێتەوە

**phobia** (fō′bi-ə), ***n.*** ترسێکی نێجگار زۆری بەردەوامی نابەجێ لە شتێك یا بارێك؛ زراوچوون؛ تۆقین.

**-phobia** (fō′bi-ə), پاشگرێکە بەمانای: ترس؛ ترسی زۆرو نابەجێ؛ زراوچوون؛ تۆقین؛ قین. ***( claustrophobia)***.

**phobic** (fō′bik, fob′ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە ترسی نێجگار زۆرو نابەجێ. (٢) لە شتێ لێ ترساو ڕاکردوو.

**Phoebe** (fē′bi), ***n.*** (١) بانووخوای مانگ (ئەفسانەی یۆنانی)

(٢) [Poetic]، مانگ.

**phoebe** (fē′bi), ***n.*** جۆرە باڵندەیەکی مێشخۆرە.

**Phoebus** (fē′bəs), ***n.*** (١) خودای خۆر (ئەفسانەی یۆنانی).

(٢) [Poetic]؛ خۆر.

**Phoenician** (fi-nish′ən, fə-nē′shən), ***adj.*** فینیقی ،گەل، زمان، کلتوور).

***n.*** (١) فینیقی؛ کەسێکی فینیقی. (٢) زمانی فینیقی.

**Phoenix** (fē′niks), ***n.*** (١) قەقنەس. باڵندەیەکی ئەفسانەییە پاش ئەوەی پێنج سەد ساڵ ژیاوە خۆی سووتاندووەو لە خۆڵەمێشەکەیەوە زیندوو بووەتەوە بە گەنجی و جوانی تا سەرلەنوێ بژێتەوە (ئەفسانەی میسری)؛ نیشانەی نەمری (٢) کەسێکی زۆر جوان یا بلیمەت؛ کەسێکی بێ هاوتا؛ نموونەی لێهاتوویی یا جوانی. (٣) [-P]؛ ناوی کۆنەستێرەیەکە.

**phon-** (fōn), = phono-.

**phonate** (fō′nāt), ***v.i.*** بێژان؛ ووتن.

**phone** (fōn), ***n.*** دانە دەنگی ئاخاوتن؛ دەنگێك (دەنگناسی)؛ یەك دانە دەنگ.

**phone** (fōn), ***n., v.t. & v.i.*** [Colloq.], = **telephone.**

**-phone** (fōn), پاشگرێکە بەمانای: دەنگ؛ تایبەتی بە دەنگ: ***( saxophone)***

**phoneme** (fō′nēm), ***n.*** فۆنیم: بچووکترین دەنگی زمانە کە مانای ووشەیەك لە ووشەیەکی تر جیادەکاتەوە: (تیپی " m " لە " meat " دا وە " h " لە " beat " دا هەریەکەیان فۆنیمێکن).

**phonemic** (fō-nē′mik), ***adj.*** (١) فۆنیمی؛ تایبەتی بە فۆنیم (ووشەی پێشوو ببینە). (٢) تایبەتی بە فۆنیمناسی.

**phonemics** (fō-nē′miks), ***n.pl.*** فۆنیمناسی (زمانەوانی) (ووشەی پێشووتر ببینە)؛ زانستی فۆنیم.

**phonetic** (fə-net′ik, fō-net′ik), ***adj.*** (١) تایبەتی بە دەنگی زمان (دەنگناسی)؛ دەنگی؛ هی شێوەی دەنگ یا تیپ. (٢) هی دەنگناسی.

(٣) لەگەڵ دەنگی ووشە یا بێژانیدا گونجاو: ***( ~ spelling)***.

**phonetically** (fə-net′i-k'l-i, fō-net′ik-li), ***adv.*** بەپێی دەنگزانی؛ بەگوێرەی پەیڕەوی زانستی دەنگ؛ بە جۆرێك کە دەنگی زمان بنوێنێ یا دەریبڕێ.

**phonetician** (fō′nə-tish′ən), ***n.*** دەنگزان؛ زانای دەنگ.

**phoneticist** (fə-net′ə-sist, fō-net′ə-sist), ***n.*** = phonetician.

**phonetics** (fə-net′iks, fō-net′iks), ***n.pl.*** دەنگزانی؛ زانستی دەنگ (زمانەوانی).

**phoney** (fō′ni), ***adj. & n.*** [Slang], = **phony.**

**phonic** (fon′ik, fō′nik), ***adj.*** (١) دەنگی؛ تایبەتی بە دەنگزانی.

(٢) [Rare]، بێژراو؛ ووتراو بە دەنگی بەرز.

**phonics** (fon′iks, fō′niks), ***n.pl.*** (١) زانستی دەنگ و دەنگ بیستن.

(٢) [Rare]، **phonetics**

(٣) فێرکردنی خوێندنەوەی زمان لەڕێی بەکارهێنانی دەنگزانییەوە.

**phono-** (fō′nō, fō′nə), ***Also*** **phon-**, پێشگرێکە بەمانای: دەنگ. ***( phonology)***

**phonogram** (fō′nə-gram′), ***n.*** فۆنۆگرام: نیشانەیەکە کە لەباتی ووشەیەك، برگەیەك، یا دەنگێك بەکاردەهێنرێ (دەنگزانی، کورتەنووسی)

**phonograph** (fō′nə-graf′, fō′nə-gräf′), ***n.*** فۆنۆگراف؛ سندووقی قەوان لێدان؛ سندووقی گۆرانی.

-phonographic ***(adj.)***; phonographically ***(adv.)***.

**phonography** (fō-nog′rə-fi), ***n.*** (١) نووسینی ووشە بەگوێرەی دەنگەکەی؛ بەکارهێنانی نیشانەکانی دەنگزانی بۆ نووسینی ووشە.

(٢) کورتەنووسی بەپێی نیشانەکانی دەنگزانی.

(٣) بەکارهێنانی سندووقی قەوان لێدان بۆ دەنگ پەیداکردن.

**phonological** (fō′nə-loj′i-k'l), ***adj. Also*** **phonologic**, هی دەنگزانی.

**phonologist** (fō-nol′ə-jist), ***n.*** = **phonetician.**

**phonology** (fō-nol′ə-ji), ***n.*** (١) (ا) **phonetics**. (ب) **phonemics**. (٢) لێکۆڵینەوەی گۆڕینی دەنگی زمانێك.

**phonometer** (fō-nom′ə-tẽr), ***n.*** پێوەری توندوتیژی و لەرەی دەنگ.

**phonoreception** (fō′nə-ri-sep′shən), ***n.*** گوێ لە دەنگ و شەپۆلی دەنگ بوون.

**phonotype** (fō′nə-tīp′ ***n.*** (١) نیشانەی دەنگ لە چاپکردندا (دەنگزانی). (٢) پەرتووکێکی چاپکراوە بە نیشانەکانی دەنگزانی لەباتی تیپی ئاسایی.

**phonotypy** (fō′nə-tī′pi), ***n.*** بەکارهێنانی نیشانەکانی دەنگزانی لەباتی تیپی ئاسایی لە چاپەمەنیدا.

**phony** (fō′ni), ***adj. Also*** **phoney**, [Slang], ساختە؛ درۆزنە؛ ڕووکەش.

***n.*** (١) شتێکی درۆزنە یا ساختە.

(٢) کەسێکی درۆزن؛ ساختەچی؛ ڕووالەتباز؛ بە درۆ خۆنوێنەر
-phonily *(adv.)*; phoniness *(n.)*.
**-phony** (fō′ni, fə-ni), پاشگرێکە بەمانای دەنگ؛ دەنگی تایبەتی: *(cacophony)*
**-phore** (fôr, fōr), پاشگرێکە بەمانای هەڵگر *(semaphore)*.
**phosgene** (fos′jēn), *n.* گازێکی بێ ڕەنگی بۆن پیسە وەك گازی ژەهراوی بەکاردەهێنرێ و شووشەو خۆم و جەوی و شتی پلاستیکی لێ درووست دەکرێ (ێنشی دەووترێ: " carbonyl chloride ").
**phosphatase** (fos′fə-tās′), *n.* فۆسفاتاز: چەند جۆرە ئەنزیمێکە لە شانەکان و شلەکانی لەشدا هەن.
**phosphate** (fos′fāt), *n.* (١) فۆسفات (کیمیا) (٢) جۆرە پەینێکی فۆسفاتاوی‌یە (٣) خواردنەوەیەکی کەف‌وکوڵاوی‌یە لە ئاوی گازاوی و شیلەو چەند دڵۆپێك ترشی فۆسفۆریك درووست دەکرێ.
**phosphatic** (fos-fat′ik), *adj.* فۆسفاتاوی؛ فۆسفاتی
**phosphatize** (fos′fə-tīz′), *v.t.* (١) کردن بە فۆسفات؛ گۆڕین بۆ فۆسفات (٢) فۆسفاتاوی کردن؛ فۆسفات لێدان.
**phospho-** (fos′fō, fos′fə), *Also* phosph-, پێشگرێکە بەمانای فۆسفۆر
**phosphor** (fos′fēr), *n.* (١) [Poetic] ئەستێرەی بەیان؛ ئاهی؛ کاروان کوژە؛ ڤینۆس. (٢) [Archaic & Poetic] phosphorus. (٣) ماددەیەکە ڕووناکی دەداتەوە کە تیشکی ئەتۆمی دەخرێتە سەر (فیزیا).
**phosphorate** (fos′fə-rāt′), *v.t.* فۆسفۆر لێدان یا تێکەڵاوکردن؛ فۆسفۆراوی کردن
**phosphoresce** (fos′fə-res′), *v.i.* شەوقدانەوە؛ درەوشانەوە؛ ڕووناکی دانەوە
**phosphorescence** (fos′fə-res′ns), *n.* (١) درەوشانەوەی فۆسفۆری؛ درەوشانەوە بەبێ گەرما لێبوونەوە (وەك ڕووناکی دانەوەی فۆسفۆر). (٢) ئەم جۆرە ڕووناکی‌یە یا درەوشانەوەیە.
**phosphorescent** (fos′fə-res′nt), *adj.* درەوشاوەی فۆسفۆری؛ درەوشاوە
**phosphoric** (fos-fôr′ik, fos-for′ik, fos-fō′rik), *adj.* فۆسفۆری
**phosphoric acid,** ترشی فۆسفۆریك (کیمیا)
**phosphorism** (fos′fə-riz′m), *n.* ژەهراوی بوون بە فۆسفۆر؛ ژەهری فۆسفۆر لێدران
**phosphorous** (fos′fēr-əs, fos-fôr′əs, fos-fō′rəs), *adj.* فۆسفۆری (کیمیا)
**phosphorus** (fos′fēr-əs), *n.* فۆسفۆر (کیمیا)
**phot** (fot, fōt), *n.* پێوانەیەکی ڕووناکی‌یە.
**photic** (fō′tik), *adj.* (١) هی ڕووناکی (٢) تایبەتی بە کارتێکردنی ڕووناکی بۆ سەر زیندەوەر.
**photics** (fō′tiks), *n.pl.* زانستی ڕووناکی؛ ڕووناکیزانی
**photo** (fō′tō), *n.* [Colloq.]. photograph.
**photo-** (fō′tō, fō′tə), پێشگرێکە بەمانای (١) بەهۆی ڕووناکی‌یەوە درووستکراو؛ هی ڕووناکی (٢) فۆتۆگرافی؛ وێنەیی؛ هی وێنەکاری *(photograph)*
**photobiotic** (fō′tō-bi-ot′ik), *adj.* بە ڕووناکی دەژی؛ ژیانی لەسەر ڕووناکی بەندە.
**photochemical** (fō′tə-kem′ə-k'l), *adj.* تایبەتی بە کاری کیمیایی ڕووناکی
**photochemistry** (fō′tō-kem′is-tri), *n.* کیمیای ڕووناکی لقێکە لە کیمیا لە کاریگەری کیمیای ڕووناکی و تینی تیشکدەرەوەی تر دەکۆڵێتەوە (وەك لە وێنەکاریدا).
**photocopy** (fō′tō-kə′pi), *n.* وێنەی دەقاودەق (شتی نووسراو یا چاپکراو)؛ وێنەی فۆتۆگرافی شتی نووسراو *(the ~ of a letter)*.
*v.t.* وێنەی دەقاودەقی فۆتۆگرافی وەرگرتن: *(to ~ a document, letter, etc.)*
**photodrama** (fō′tə-drä′mə, fō′tə-dram′ə), *n.* = photoplay.
**photoduplicate** (fō′tə-dōō′plə-kit, fō′tə-dū′plə-kit), *v.t.* = photocopy.
**photodynamics** (fō′tō-dī-nam′iks), *n.pl.* (١) کاریگەری ڕووناکی بۆ سەر زیندەوەر. (٢) زانستی ئەم کاریگەری‌یە.
**photo finish,** پێشبڕکێ‌یەکە ئەنجامەکەی ئەوەندە لەیەکەوە نزیکە بە وێنەی فۆتۆگرافی نەبێ نازانرێ کێ بردوویەتی‌یەوە.
**photogenic** (fō′tə-jen′ik), *adj.* (١) لە ڕووناکی‌یەوە پەیدابووە. (٢) لە وێنەدا جوان دەردەچێ (مرۆڤ)؛ وێنەی لێ دێت. (٣) شەوقدەرەوە؛ ڕووناکی دەرەوە.
**photograph** (fō′tə-graf′, fō′tə-gräf′), *n.* وێنە؛ فۆتۆگراف.
*v.t.* وێنەگرتن: *(to ~ a person, scene, etc.)*.
*v.i.* (١) وێنەگری کردن. (٢) وێنەگیران (بەتایبەتی جوان دەرچوون لە وێنەدا): *(She ~s well.)*
**photographer** (fə-tog′rə-fēr), *n.* وێنەگر (بە پیشە).
**photographic** (fō′tə-graf′ik), *adj.* (١) وێنەیی؛ فۆتۆگرافی. (٢) لە وێنەگرتندا بەکارهێنراو: *(a ~ lens)*. (٣) لە وێنە دەچێ (لە تەواوی و دەربڕینی دەقاودەقی هەموو شتدا). (٤) شتی بە باشی و تەواوی و وردی لەبیرە: *(He has a ~ memory.)*
-photographically *(adv.)*.
**photography** (fə-tog′rə-fi), *n.* وێنەگری؛ وێنەکاری.
**photokinesis** (fō′tō-ki-nē′sis, fō′tō-kī-nē′sis), *n.* جووڵە یا بزوانی لە ڕووناکی‌یەوە پەیدابوو (فەسلەجە).
-photokinetic *(adj.)*.
**photolysis** (fō-tol′ə-sis), *n.* شیبوونەوەی کیمیایی بەهۆی ڕووناکی‌یەوە.
**photomap** (fō′tə-map′), *n.* نەخشەی پێکهاتوو لە وێنەی لە هەواوە گیراو.
**photometer** (fō-tom′ə-tēr), *n.* ڕووناکی پێوەر: ئامێرێکە توندو تیژی ڕووناکی دەپێوێ.
**photometric** (fō′tə-met′rik), *adj.* هی ڕووناکی پێوەرو ڕووناکی پێوان.
**photometry** (fō-tom′ə-tri), *n.* (١) ڕووناکی پێوان لەڕووی توندوتیژی‌یەوە. (٢) ئەو بەشەی زانیاری ڕووناکی و بینینە کە لە پێوانی توندوتیژی ڕووناکی دەکۆڵێتەوە.
**photomicrograph** (fō′tə-mī′krə-graf′, fō′tə-mī′krə-gräf′), *n.* (١) وێنەی بە گەردبین وەرگیراو. (٢) وێنەیەکی زۆر بچووك.
-photomicrographic *(adj.)*; photomicrography *(n.)*.
**photomural** (fō′tə-myoor′əl), *n.* وێنەیەکی گەورەکراوە دەنووسێنرێ بە دیوارێکەوە بۆ جوانی.
**photon** (fō′ton), *n.* فۆتۆن: ئەندازەی وزەی ڕووناکی.
**photophilous** (fō-tof′ə-ləs), *adj.* حەزکەر لە ڕووناکی (ڕووەك)؛ لە ڕووناکیدا باش گەورەبوو: *(~ plants)*.
**photophobia** (fō′tə-fō′bi-ə), *n.* ترسی ئێجگار زۆرو نابەجێ لە ڕووناکی.
**photophobic** (fō′tə-fob′ik), *adj.* لە ڕووناکی زۆر ترساو.
**photoplay** (fō′tə-plā′), *n.* شانۆنامەی وێنەیی یا سینەمایی.
**photosensitive** (fō-tə-sen′sə-tiv), *adj.* هەستیار بۆ ڕووناکی؛ ڕووناکی زۆر کاری لێ دەکات.
**photostat** (fō′tə-stat′), *n.* (١) فۆتۆستات: ئامێری گرتنی وێنەی دەقاودەقی فۆتۆگرافی شتی نووسراو و چاپکراو. (٢) وێنەیەکی وەها گیراو.
*v.t.* وێنەی دەقاودەقی فۆتۆگرافی گرتن.

**-photostatic** *(adj.)*.

**photosynthesis** (fō´tə-sin′thə-sis), *n.* به ڕووناکی پێکهاتن: بریتییه له پێکهێنانی خواردەمەنی له خانەی ڕووەکدا به یەك پێگرتنی ئاوو گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەهۆی تیشکی خۆرو ماددەی سەوزەوە.

**-photosynthetic** *(adj.)*; **photosynthetically** *(adv.)*.

**phototaxis** (fō´tə-tak′sis), *n. Also* **phototaxy**, جوڵەی تیشکی: جوڵانەوەیەکە کە بەهۆی ڕووناکییەوە دەبێت (زیندەوەرزانی).

**phototelegraphy** (fō´tō-tə-leg′rə-fi), *n.* (١) پەیوەندی تیشکی (وەك به تیشکی ڕۆژدانەوە به ئاوێنە).
(٢) ناردنی تیشکی نووسراوو وێنە.

**phototherapeutics** (fō´tə-ther´ə-pū′tiks), *n.pl.* = **phototherapy**.

**phototherapy** (fō´tə-ther′ə-pi), *n.* دەرمانکردنی نەخۆشی به تیشکی ڕووناکی (بەتایبەتی نەخۆشی پێست).

**photothermic** (fō´tə-thũr′mik), *adj.* هی ڕووناکی و گەرمی.

**phototonus** (fō-tot′ə-nəs), *n.* ڕووناکی بردەڵەیی (زیندەوەرزانی): هەستیاری بۆ ڕووناکی.

**phototropism** (fō-tot′rə-piz′m), *n.* جوڵە بەرەو ڕووناکی: پەرەسەندن بە ڕووناکی.

**photozincography** (fō´tō-ziŋ-kog′rə-fi), *n.* هەڵکەندنی زینکۆگرافی: پەڕەی چینکۆ بەکارهێنان لە کلێشە هەڵکەندنی تیشکیدا.

**phrase** (frāz), *n.* (١) شێوەی دەربڕین: شێوازی دەربڕینی تایبەتی.
(٢) ووتەیەکی کورت و قوت و جێگر.
(٣) دەستەواژە (ڕێزمان): *( at home; in the garden; giving parties; doing my work; fresh vegetables; the same girl)*
(٤) پارچەیەك مۆسیقا.
***v.t.*** (١) دارشتن: دەربڕین (به نووسین یا دووان)؛ ووتن: *( How do you ~ this idea?)*
(٢) بەش بەش کردنی ووتارێکی خوێنراوە (بۆ وەستان پاش هەموو بەشێك).
(٣) بەش بەش کردنی پارچەیەك مۆسیقا.

**-phrasal** *(adj.)*; **phrasally** *(adv.)*.

**phraseogram** (frā′zi-ə-gram´), *n.* نیشانەی دەستەواژە (کورتە نووسین)

**phraseologist** (frā´zi-ol′ə-jist), *n.* (١) کەسێکە کە زۆر گوێ دەدات بە شێوەی دارشتن و نووسین و دووان. (٢) کەسێکی دەستباڵا لە دارشتنی ووشەو دەستەواژەدا؛ شارەزای دارشتن؛ ووشەدارێژ.

**phraseology** (frā´zi-ol′ə-ji), *n.* (١) شێوەی دارشتن (نووسین، دووان)؛ شێوازی نووسین و دووان؛ شێوازی دەربڕین.
(٢) زمان و زاراوەی تایبەتی: *( nautical ~ )*.

**phrasing** (frāz′iŋ), *n.* (١) دارشتن (دەستەواژە).
(٢) شێوەی دارشتن: شێوەی دەربڕین.
(٣) شێوازی لێدانی پارچەیەك مۆسیقا

**phratry** (frā′tri), *n.* تیرە؛ خێڵ.

**phrenetic** (fri-net′ik), *adj. & n.* = **frenetic**.

**phrenic** (fren′ik), *adj.* (١) ناوپەنچکی: هی پەردەی ماسولکەیی نێوان بۆشایی سنگ و سك. (٢) مێشکی؛ تایبەتی بە مێشك.

**phrenitis** (fri-nī′tis), *n.* (١) هەوکردنی مێشك (کە لەرزوتا و ووڕێنەی لەگەڵدایە). (٢) هەوکردنی ناوپەنچك؛ داگیرسانی پەردەی نێوان بۆشایی سنگ و سك

**phreno-** (fren′ō, fren′ə), پێشگرێکە بەمانای: ناوپەنچك؛ پەردەی نێوان بۆشایی سنگ و سك.

**phrenological** (fren´ə-loj′i-k'l), *adj. Also* **phrenologic**, هی کاسەی سەر زانین

**phrenologist** (fre-nol′ə-jist, fri-nol′ə-jist), *n.* کاسەی سەر زان (ووشەی داهاتوو ببینە).

**phrenology** (fre-nol′ə-ji, fri-nol′ə-ji), *n.* کاسەی سەر زانی: زانستی کاسەی سەر؛ زانینی زیرەکی و سرووشتی کەسێك لەڕێی لێکۆڵینەوەی کاسەی سەرییەوە.

**phrensy** (fren′zi), *n. & v.t.* = **frenzy**.

**phthalein** (thal′ēn, fthal′ē-in), *n.* فسالین: جۆرە بۆیە یا خومێکە

**phthalic acid,** ترشی فسالیك.

**phthisis** (thī′sis, fthī′sis), *n.* دەردەبارێکە؛ سیل.

**phycology** (fī-kol′ə-ji), *n.* قەوزەناسی؛ زانستی قەوزە.

**phycomycete** (fī´kō-mī-sēt′), *n.* کەڕووی قەوزەیی.

**phylactery** (fi-lak′tēr-i, fə-lak′tri), *n.* نوشتە؛ چاوەزار؛ جادوو.

**phylaxis** (fi-lak′sis), *n.* بەرهەڵستی نەخۆشی؛ هێزی بەرگری نەخۆشی.

**phyle** (fī′lē), *n.* تیرە؛ ڕێکخراوێکی خزم و کەس وکار لە یۆنانی کۆندا.

**phylesis** (fī-lē′sis), *n.* پێشکەوتنی توخمی؛ گۆڕانی توخمی بەرەو بەرزی (زیندەوەرزانی)

**phyletic** (fī-let′ik), *adj.* ڕەگەزی؛ توخمی.

**-phyll** (fil), پاشگرێکە بەمانای: گەڵا: *( chlrorophyll)*.

**phyllo-** (fil′ō, fil′ə), پێشگرێکە بەمانای: گەڵا: *( phyllophagous)*

**phylloclade** (fil′ə-klād´), *n. Also* **phylloclad**, لاسکی وەك گەڵا: قەفێك یا لقێکی پانە کاری گەڵا دەکات.

**phyllode** (fil′ōd), *n.* لاسکە گەڵایەکی پانە وەك گەڵا کاردەکات

**phylloid** (fil′oid), *adj.* لە گەڵا دەچێ؛ وەك گەڵا وایە.

**phyllome** (fil′ōm), *n.* گەڵا؛ ئەندامێکی وەك گەڵا.

**phyllopod** (fil′ə-pod´), *n.* چەند جۆرە زیندەوەرێکی قاوغدارە پەلی وەك گەڵای هەیە بۆ مەلەکردن.

**phyllotaxy** (fil′ə-tak´si), *n. Also* **phyllotaxis**, (١) شێوەی ڕێکخرانی گەڵا بە لاسکەوە؛ باری ڕیزبوون و ڕێك وپێکی گەڵا بە لاسکەوە.
(٢) دەستوور یا شێوەو بنچینەی ئەم ڕێکخرانە

**-phyllous** (fil′əs), پاشگرێکە بەمانای: ئەوەندە گەڵای پێوەیە.

**phylo-** (fī′lō, fī′lə), پێشگرێکە بەمانای: تیرە؛ خێڵ؛ توخم؛ ڕەگەز: *( phylogeny)*

**phylogeny** (fī-loj′ə-ni), *n. Also* **phylogenesis**, مێژووی- گۆڕان و پەرەسەندنی توخمە گیاندارێك یا ڕووەکێك.

-**phylogenetic**; **phylogenic** *(adj.)*; **phylogenetically** *(adv.)*.

**phylon** (fī′lon), *n.* توخم (زیندەوەر، ڕووەك).

**phylum** (fī′ləm), *n.* (١) توخم (زیندەوەر: ڕووەك).
(٢) یەکێك لە خێزان یا کۆمەڵە زمانە هاوتوخمەکانی جیهان.

**physiatrics** (fiz′i-ə-triks), *n.pl.* = **physical therapy**.

**physiatry** (fiz′i-ə-tri), *n.* = **physical therapy**.

**physic** (fiz′ik), *n.* (١) [Rare]، فیزیا.
(٢) [Archaic]، پزیشکەوانی؛ زانستی دەرمان و دەرمانکاری.
(٣) دەرمان؛ دەرمانی ڕەوانی.
***v.t.*** (١) دەرمان پێدان (بەتایبەتی دەرمانی ڕەوانی). (٢) ڕەوانکردن.
(٣) چاکردنەوە.

**physical** (fiz′i-k'l), *adj.* (١) سرووشتی؛ تایبەتی بە سرووشت: *( the ~ universe)*
(٢) هی زانیاری سرووشتی؛ هی فەلسەفەی سرووشتی.
(٣) بەپێی یاسای سرووشتی؛ تایبەتی بە یاسای سرووشتی: *( The force of gravity is a ~ fact.)*
(٤) فیزیایی؛ ئەنجامی یاسا و هێزی فیزیاییە
(٥) تەنی؛ لەشی؛ جەستەیی: *( ~ exercise)*.
***n.*** = **physical examination**.

**physical chemistry,** کیمیای سرووشتی.

**physical education,** وەرزش؛ پەروەردەی جەستەیی

**physical examination,** تێڕوانین یا پشکنینی پزیشکی لەش.
**physical geography,** جوگرافیای سرووشتی.
**physically** (fiz′i-k'l-i, fiz′ik-li), *adv.* (١) لە باری یاسای سرووشتەوە. (٢) لەشی؛ جەستەیی؛ لەڕووی لەشەوە: *(He is ~ fit for the trip.)*
**physical science,** زانستی سرووشتی (کیمیا، فیزیا، زەمیناسی).
**physical therapy,** چارەکردنی سرووشتی: چارەسەرکردنی نەخۆشی و برینداری بەهۆی چارەسەری سرووشتی و میکانیکییەوە (وەك وەرزش و شێلان و ئاو و گەرما و ڕووناکی و کارەبا) نەك بە دەرمان
-physical therapist *(n.)*.
**physician** (fə-zish′ən), *n.* پزیشك؛ دکتۆر
**physicist** (fiz′ə-sist), *n.* زانای فیزیا؛ فیزیازان.
**physics** (fiz′iks), *n.pl.* (١) فیزیا (٢) نیشانەو یاساو کردارو کارلەیەککردنی سرووشتی
**physio-, physi-** (fiz′i-ō, fiz′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) سرووشتی *(physiography)*. (٢) تەنی؛ لەشی *(physiatry)*.
**physiognomic** (fiz′i-og-nom′ik), *adj.* تایبەتی بە سرووشت و ڕەووشتی مرۆڤ زانین بەهۆی لێ ووردبوونەوەی ڕوخسارەوە؛ تایبەتی بە ڕوخسار؛ هی دەموچاو.
-physiognomical *(adj.)*: physiognomically *(adv.)*.
**physiognomy** (fiz′i-og′nə-mi, fiz′i-on′ə-mi), *n.* (١) زانینی ڕەووشت و سرووشتی مرۆڤ لە ڕێی لێ ووردبوونەوەی ڕوخسارەوە. (٢) دەموچاو؛ ڕوخسار؛ ڕوو. (٣) تایبەخۆی ئاشکرا؛ ڕووالەت.
-physiognomist *(n.)*.
**physiography** (fiz′i-og′rə-fi), *n.* جوگرافیای سرووشتی.
**physiological** (fiz′i-ə-loj′i-k'l), *adj. Also* physiologic, (١) فەسلەجەیی؛ تایبەتی بە کارکردنی ئاسایی لەشی گیاندار (٢) یارمەتی کارکردنی ئاسایی ئەندامەکانی لەشی گیاندار دەدات.
-physiologically *(adv.)*.
**physiology** (fiz′i-ol′ə-ji), *n.* (١) فسیولۆجی؛ زانستی کارکردنی ئاسایی ئەندامەکانی لەشی گیاندار. (٢) کتێبێك یا ووتارێکی ئەم زانستە. (٣) کارکردنی ڕێك‌وپێکی ئەندامەکانی لەشی گیاندار
-physiologist *(n.)*.
**physiotherapy** (fiz′i-ō-ther′ə-pi), *n.* physical-therapy.
**physique** (fi-zēk′), *n.* لەشولار؛ بەژن‌وبالا؛ شێوەی پێکهاتن و بەهێزی لەش
**phyto-** (fi′tō, fi′tə), پێشگرێکە بەمانای ڕووەك؛ شینایی؛ سەوزایی؛ گژوگیا *(phytogeography)*
**phytogenesis** (fi′tō-jen′ə-sis), *n. Also* phytogeny, مێژووی بنچینەو گۆڕانی ڕووەك
-phytogenetic: phytogenetical *(adj.)*.
**phytogenic** (fi′tō-jen′ik), *adj.* لە بنەڕەتدا لە ڕووەکەوە هاتووە؛ بنچینەکەی ڕووەك بووە (خەڵوز).
**phytogeography** (fi′tō-ji-og′rə-fi), *n.* جوگرافیای ڕووەك لە دابەشبوونی ڕووەك بەسەر زەویدا دەکۆڵێتەوە
**phytography** (fi-tog′rə-fi), *n.* زانستی نیشانەکردنی ڕووەك
**phytology** (fi-tol′ə-ji), *n.* [Rare], = botany.
**phytophagous** (fi-tof′ə-gəs), *adj.* گیاخۆر؛ بە گژوگیا دەژی
**pi** (pī), *n.* (١) کۆمەڵێك تیپی چاپەمەنی تێکەڵ‌وپێکەڵاو (٢) کۆمەڵێکی تێکەڵ‌وپێکەڵاو
*v.t.* تێکەڵ‌وپێکەڵ کردن.
**pi** (pī, pē), *n.* (١) تیپی شازدەهەمی ئەلف‌وبێی یۆنانییە (٢) نیشانەی ڕێژەی کەمەرەی بازنەیەك و تیرەکەیەتی.
**pia mater** (pī′ə mā′tēr), [L.], پەردەیەکی تەنکە بەدەوری مێشك و مۆخی بڕبڕەدا.
**pianissimo** (pē′ə-nis′ə-mō′), *adj. & n.* زۆر نەرم (مۆسیقا)؛ بەنەرمی.
**pianist** (pi-an′ist, pyan′ist, pē′ə-nist), *n.* پیانۆژەن؛ پیانۆلێدەر.
**piano** (pi-an′ō, pyan′ō), *n.* پیانۆ.
**piano** (pi-ä′nō, pyä′nō), *adj. & adv.* نەرم (مۆسیقا)؛ بەنەرمی.
*n.* پارچەیەك مۆسیقای نەرم
**pianoforte** (pi-an′ə-fôrt′, pyan′ə-fōr′ti), *n.* = **piano.**
**piaster, piastre** (pi-as′tēr), *n.* (١) [Rare] ، دۆلاری ئیسپانی. (٢) قرش (پارەی میسرو تورکیا).
**piazza** (pi-az′ə), *n.* (١) مەیدانی گشتی (بەتایبەتی لە شارێکی ئیتالیدا)؛ گۆڕەپان (ناوشار). (٢) ڕاڕەوێکی سەرگیراوی پایەدار. (٣) دالان؛ هەیوان.
**pica** (pī′kə), *n.* تیپی بچووك (چاپەمەنی)؛ قەبارەیەکی بچووکی تیپی چاپەمەنییە.
**pica** (pī′kə), *n.* بێزوو؛ بێزووکردن.
**picador** (pik′ə-dôr′), *n.* پیکادۆر: ئەسپ سوارێکە لە سەرەتای شەڕەگای ئیسپانیدا ئەقیزە دەکات بە گاکەدا تاکو تووڕەی بکات و ئامادەی بکات بۆ شەڕ.
**picaresque** (pik′ə-resk′), *adj.* (١) هی سەرسەری و زۆڵ و قوماربازو پیاوخراپ و چەتەو کردارەکانیان. (٢) تایبەتی بە جۆرە چیرۆکێکە کە لە ئیسپانیاوە داهاتووە دەربارەی پیاوی سەرسەری و زۆڵ و قوماربازو چەتەو خراپەکارو کردارەکانیان: *(a ~ novel)*.
**picaroon** (pik′ə-rōōn′), *n.* (١) سەرسەری؛ چەتە؛ دز؛ کەسێکی زۆڵ و کەڵەکچی. (٢) چەتەی دەریا. (٣) کەشتی چەتەی دەریا.
**picayune** (pik′i-ūn′), *n.* (١) (ا) نیوریاڵی ئیسپانی کۆن (کە لە بەشی خوارووی ئەمەریکا بەکاردەهێنرا). (ب) پارەیەکی پێنج فلسی؛ پارەی کەم نرخ (٢) شتێکی بێ نرخ؛ شتێکی هیچ‌وپووچ: *(not worth a ~)*.
*adj.* (١) هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ؛ بێ بایەخ. (٢) گوێ بە شتی هیچ‌وپووچ و بێ بایەخ دەر.
**picayunish** (pik′i-ūn′ish), *adj.* = picayune.
**piccalilli** (pik′ə-lil′i), *n.* ترشیاتی سەوزە
**piccolo** (pik′ə-lō′), *n.* ئامێرێکی مۆسیقایی بچووکە لە بابەتی فلووت یا شمشاڵ.
**pice** (pīs), *n.* پارەیەکی بچووکی هیندی کۆنە
**piceous** (pis′i-əs, pī′si-əs), *adj.* (١) بەئاسانی گڕگرتوو. (٢) ڕەش وەك قیر (زیندەوەرزانی).
**pick** (pik), *n.* قولنگ؛ پاچ.
**pick** (pik), *v.t.* (١) هەڵکەندن بە پاچ یا قولنگ (٢) کونکردن بە شتێکی نووك تیژ. (٣) (ا) کراندن؛ هەڵکڕاندن. (ب) ددان ئاژنین؛ لووت دەردان؛ پاکردنەوە لە شتی پیس: *(to ~ one's nose)*
(٤) ڕنین؛ کردنەوە (گوڵ، میوە)؛ چنینەوە؛ لێکردنەوە؛ چنین: *(to ~ flowers, fruits, cotton, etc.)*
(٥) ئاوەڕووتکردن؛ پەڕلێکردنەوە.
(٦) بە دەنووك خواردن یا هەڵگرتن؛ هەڵگرتن؛ دەنووك لێدان؛ چنینەوە
(٧) بە قێزوبێزەوە خواردن؛ کەم کەم خواردن.
(٨) لێککردنەوە؛ دڕاندن؛ هەڵتلێشاندن.
(٩) هەڵبژاردن: *(The best swimmer was ~ed.; to ~ a winner)*
(١٠) شەڕفرۆشتن: *(to ~ a fight with)*.
(١١) دۆزینەوە (کەم‌وکووڕی): *(He ~ed holes in their argument.)*
(١٢) لێدان (گیتار، عود).

(١٣) قفل برین: *( to ~ a lock)* .

(١٤) گیرفان برین. *( to ~ a pocket)* .

*v.i.* (١) به قیزوبیزەوە خواردن؛ به نابەدڵی‌یەوە خواردن. (٢) دزین.

(٣) قوڵنگ بەکارهێنان. (٤) ڕنین؛ کردنەوە (گوڵ، میوە، بەر).

(٥) ڕنران؛ لێکرانەوە. *( Grapes ~ easily.)* .

(٦) هەڵبژاردن (بەتایبەتی بەووردی و قیزوبیزەوە)

(٧) هەمیشە ڕەخنەی هیچ‌وپووچ گرتن.

*n.* (١) قوڵنگ لێدان؛ به ئامێرێکی نووك تیژ هەڵکەندن. (٢) هەڵبژاردن.

(٣) هەڵبژاردە: *( the ~ of the crop)* .

(٤) ئەو بەرەی لە یەك جاردا دەڕنرێ یا دەچنرێتەوە

**have a bone to pick with someone,** سکاڵا هەبوون بەرامبەر.

**pick and choose,** به هەوەسی خۆ هەڵبژاردن؛ سەرپشك بوون.

**pick apart ( or to pieces ),** (١) یەکالاکردنەوە؛ هەڵوەشاندن؛ لێك جیاکردنەوە؛ شڕو ووڕکردن؛ پارچەپارچەکردن

(٢) کەم‌وکووری زۆر تێدا دۆزینەوە؛ زۆر ڕەخنەلێگرتن بە کینەو ناحەزانە؛ شڕو ووڕکردن (مەجاز): *( to pick someone's writing apart)* .

**pick at,** (١) به قیزوبیزەوە خواردن؛ به لالووتەوە خواردن

(٢) [Colloq.]، ڕەخنەلێگرتن بە خۆڕایی؛ سەرکردنەسەر؛ مێشك بردن.

(٣) دەستکاری کردن؛ یاری پێکردن.

**pick off,** (١) لێکردنەوە؛ لێ لابردن. (٢) پێکان.

**pick on,** (١) هەڵبژاردن.

(٢) [Colloq.]، سەرکردنەسەر؛ کلك پێوەکردن؛ شەڕ پێ فرۆشتن؛ ڕەخنەلێگرتن. *( Everyone in the family picked on him.)* .

**pick one's way,** لەسەرخۆو بە وریایی بۆ پێشەوە چوون.

**pick out,** (١) هەڵبژاردن.

(٢) دەستنیشانکردن؛ جیاکردنەوەو هەڵبژاردن (لەناو کۆمەڵێکی گەورەدا).

(٣) تێگەیشتن؛ لێکدانەوە

**pick over,** باشترین لێ هەڵبژاردن: *( The orchard has been picked over.)*

**pick up,** (١) به قوڵنگ زەوی هەڵکەندن.

(٢) هەڵگرتن لە زەوی بەرزکردنەوە.

(٣) (ا) فێربوون *( to pick up a habit, language, etc.)* .

(ب) گرتن (نەخۆشی)؛ تووش بوون؛ هەڵگرتن: *( to pick up germs)* .

(٤) دەستکەوتن: دۆزینەوە؛ دۆزینەوەو وەرگرتن بە ڕێکەوت.

(٥) بۆ وەستان‌و سوارکردن یا هەڵگرتن: *( to pick up a hitchhiker; The train picked up passengers along the way.)*

(٦) پێ پێوەمان؛ پێ پێگرتن؛ خێراکردن: *( The bus picked up speed after we left town.)*

(٧) چاکبوونەوە؛ خۆگرتنەوە (پاش ژێرکەوتن یا پارە لەکیس چوون)؛ دەستکەوتنەوە

(٨) هەڵسانەوە (پاش کەوتن یا ژێرکەوتن).

(٩) گرتن. *( He was picked up by the police.)* .

(١٠) (ا) بەدی کردن؛ بینین: *( to pick up a star through a telescope)*

(ب) بیستن؛ گوێ لێ بوون؛ دۆزینەوە: *( to pick up a station on the radio)*

(١١) پاکردنەوە؛ خاوێن کردن (ژوور): *( Please pick up after you finish eating.)*

(١٢) دان (کرێی میوانخانە یا چێشتخانە یا شتی تر، شتی کڕاو... هتد): *( Her husband will pick up the tab.)*

(١٣) [Colloq.]، ناسین‌و بردن لەگەڵ خۆدا؛ دۆزینەوەو ئاشنایی لەگەڵ پەیداکردن (بۆ دەستبازی)؛ هەڵگرتن: *( He picked up a girl at the bar.)*

**pickaback** (pik′ə-bak′), ***adv.*** ***Also*** **piggyback.** (١) بە کۆڵ؛ بە قەلاندۆشکان. *( He carried the child ~.)* .

(٢) هی فڕینی فڕۆکەیەك بەسەر پشتی فڕۆکەیەکی ترەوە، یا گوێزانەوەی لۆری بە شەمەندەفەر، یا ئوتومبیل بە لۆری.

**pickaninny** (pik′ə-nin′i), ***n.*** منداڵی قولەڕەش (لەڕووی سووکایەتیەوە).

**pickax** (pik′aks′), ***n.*** پاچ؛ قوڵنگ.

*v.t. & v.i.* قوڵنگەکاری کردن؛ پاچکاری کردن؛ قوڵنگە بەکارهێنان؛ پاچ لێدان.

**pickaxe** (pik′aks′), ***n.***, ***v.t. & v.i.*** = pickax.

**picked** (pikt), ***adj.*** (١) هەڵبژێرراو (بەتایبەتی بەووردی): *( ~ men)* .

(٢) ڕنراو؛ لێکراوە (گوڵ، میوە)؛ کراوەتەوە لە درەختەکە: *( ~ fruit)* .

(٣) به قوڵنگ هەڵکەنراو و هەڵگێراوە؛ قوڵنگکاری تێداکراو.

**pickerel** (pik′ẽr-əl, pik′rəl), ***n.*** ماسی‌یەکی ناو ڕووباری لووت درێژی کاژێر دەرپۆقیوی ددان تیژە.

**picket** (pik′it), ***n.*** (١) مێخ؛ سنگ؛ مێخی ئەستووری نووك تیژ (وەك هی تەیمان). (٢) سەربازی پاسەوانی ئۆردوگا (بۆ پاراستنی لە هێرشی لە ناکاو).

(٣) ئەندامی ڕێکخراوێکی کرێکارانی مانگرتووە کە لەبەردەم کارگەدا ڕیز دەگرێ لەگەڵ ئەندامانی تردا بە درووشمەوە بۆ ڕێگرتن لەوانەی دەیانەوێ ئیش بکەن. (ئەمە لەبەردەم فرۆشگاو دەزگای بازرگانی‌و فرۆکەیشدا دەبێت)؛ کرێکاری مانگرتووی درووشم هەڵگرتوو

*v.t.* (١) تەیمان کردن؛ بە سنگ یا مێخی نووك تیژ دەورەگرتن.

(٢) وڵاخ بەستنەوە بە سنگەوە. (٣) (ا) پاساوڵ دانان لەبەردەم ئۆردوگادا

(ب) ئۆردوگا پاراستن بە پاسەوانی بەردەرگا.

(٤) کرێکاری مانگرتوو دانان لەبەردەم کارگەدا بۆ ڕێگرتن لەوانەی دەیانەوێ ئیش بکەن: *( to ~ a factory)* .

*v.i.* بەردەمی کارگە گرتن بۆ ڕێگرتن لە ئیشکەران (کرێکاری مانگرتوو).

**picket fence,** تەیمانی سنگ یا مێخی نووك تیژ.

**picket line,** ڕیزی کرێکارانی مانگرتوو بە درووشمەوە لەبەردەم کارگەدا (بۆ پڕوپاگەندەو ڕێگرتن لەوانەی دەیانەوێ ئیش بکەن).

**picking** (pik′iŋ), ***n.*** (١) هەڵگرتن؛ ڕنین؛ بڕین (قفڵ، گیرفان).

(٢) *(pl.)* (ا) بەرماوە؛ پاشماوە.

(ب) بەشی خۆ لە تاڵانی؛ تاڵانی؛ شتی دزراو؛ دەسکەوتی ناڕەوا.

**pickle** (pik′'l), ***n.*** (١) سوێراوی ترشیات.

(٢) ترشیات؛ خەیاری ترشیات. (٣) گیراوەیەکی ترشەڵۆکە (بۆ پاککردنەوەی کیمیایی کانزا لە ژەنگ‌و پووڵەکە... هتد).

(٤) گرفتاری؛ بارێکی زۆر ناخۆش یا دژوار.

*v.t.* ترشیات کردن؛ کردن بە ترشیات؛ خۆشکردن.

**pickled** (pik′'ld), ***adj.*** [Slang]. سەرخۆش؛ مەست؛ کەیل.

**picklock** (pik′lok′), ***n.*** (١) قفڵبڕ؛ دز. (٢) ئامێری قفڵ بڕین.

**pick-me-up** (pik′mi-up′), ***n.*** [Colloq.], خواردنەوەیەکی کحووڵ ووریاکەرەوەیە.

**pickpocket** (pik′pok′it), ***n.*** گیرفانبڕ.

**pickup** (pik′up′), ***n.*** (١) هەڵگرتنەوە لە زەوی.

(٢) پیکاب: جۆرێکە لە ئوتومبیل.

(٣) توانای بێن گرتن؛ بێن گرتن؛ خێراکردن: *( a sports car with good ~ )*

(٤) [Colloq.]، بەرەو باشی چوون (بازرگانی)؛ زیادبوون: *( a ~ in sales)*

(٥) [Slang]، گرتن (بەند).

(٦) کەسێکی هەڵگیراو: (ا) ڕێبوار یا بار.

(ب) **hitchhiker**

(ج) کەسێکە کە ئاشنایەتی لەگەڵ دەگیرێ بۆ دەستبازی‌و جووت بوون.

(٧) وەرگرتن (رادیۆ، تەلەفزیۆن).

**picky** (pik′i), ***adj.*** [Colloq.], زۆر بە قێزوبێز؛ زۆر بە ڕەخنە.

**picnic** (pik′nik), ***n.*** (١) سەیران.

(٢) [Slang]، کارێکی ئاسان؛ ئیشێکی خۆش‌و ئاسان.

*v.i.* سەیران کردن؛ چوون بۆ سەیران.

-picnicker *(n.)*.

**pictograph** (pik'tə-graf', pik'tə-gräf'), *n.* (١) وێنەیەکە کە بیرێك دەردەبڕێ (وەك نووسینی هیرۆگلیفی). (٢) ئەم جۆرە نووسینە.
**pictography** (pik-tog'rə-fi), *n.* نووسینی وێنەیی؛ نووسین بە وێنە (وەك هیرۆگلیفی).
-pictographic *(adj.)*; pictographically *(adv.)*.
**pictorial** (pik-tôr'i-əl, pik-tō'ri-əl), *adj.* (١) [Rare]. تایبەت بە نیگارکێش؛ هی نیگار یا تابلۆ
(٢) وێنەیی؛ لە وێنە پێکهاتوو: *( a ~ magazine)*.
(٣) ڕوون وەك وێنە (نووسین، نیشانەهەڵدان، باس)؛ دەڵێی بە وێنە دەربڕراوە؛ لە وێنەچوو: *( ~ writing)*.
*n.* گۆڤارێکی لە وێنە پێکهاتوو.
**picture** (pik'chēr), *n.* (١) وێنە
(٢) وێنەی نموونەیی؛ نموونە؛ وێنە؛ وێنەی دەقاودەق: *( She is the ~ of her mother.; That cat is the ~ of laziness.)*
(٣) شتێکی جوان و ڕێکوپێك: *( The garden was a ~ .)*.
(٤) شتێکی ڕوونی وەك وێنە لە مێشکدا؛ بیری ڕوون.
(٥) نیشانەهەڵدان؛ باس. (٦) هەموو شتێك دەربارەی ڕووداوێك.
(٧) تابلۆ. (٨) فیلمی سینەما.
*v.t.* (١) وێنەگرتن؛ نیگارکێشان. (٢) دەرخستن بەڕوونی؛ پیشاندان.
(٣) ناسکردن؛ نیشانەهەڵدان
(٤) هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بە خەیاڵ وێنەکێشان *( to ~ something in one's mind)*
**picture gallery,** پیشانگای وێنە
**picturesque** (pik'chēr-esk'), *adj.* (١) جوان؛ دڵگیر؛ وەك وێنە جوانە *( a ~ mountain, city, beach, etc.)*.
(٢) ئەنتیکەو جوان. (٣) ڕوون *( ~ language)*.
**picture writing,** (١) نووسینی وێنەیی (وەك هیرۆگلیفی).
(٢) وێنەی بەکارهێنراو لەم جۆرە نووسینەدا.
**picul** (pik'ul), *n.* سەنگێکی چینییە
**piddle** (pid''l), *v.t.* کات بەفیڕۆدان؛ کات کوشتن
*v.i.* (١) بە شتی هیچوپووچەوە خۆ خەریك کردن؛ خاوەخاوکردن: *( to ~ around)*
(٢) میزکردن (وشەی منداڵان).
**piddling** (pid'liŋ), *adj.* هیچوپووچ؛ بێ فەڕ؛ هیچ؛ بێ بایەخ.
**piddock** (pid'ək), *n.* جۆرە گیاندارێکی نەرمی قاڵەداری ئاوییە.
**pidgin** (pij'in), *n. Also* pigeon, زمانی هەرەمە؛ زمانێکی تێکەڵاوە لە دوو زمان یا زیاتر بۆ قسەپێکردن لەلایەن چەند گەلێکی جیاوازەوە.
**Pidgin English,** *Also* pidgin English, جۆرە زمانێکی ئینگلیزی تێکەڵاوو پێکەڵاوی بازرگانییە لە ڕۆژهەڵاتی دوور.
**pie** (pī), *n.* (١) جۆرە شیرینییەکە تامەکەی وەك پاقلاوەو کولیچە وایە.
(٢) [Slang]. شتێکی زۆر ئاسان یا خۆش و باش.
pie in the sky, خەیاڵی پلاو؛ خەون؛ ئومێدی بۆش.
**pie, pi** (pī), *n.* (١) کۆمەڵێك تیپی چاپەمەنی تێکەڵاوو پێکەڵاو
(٢) کۆمەڵێك شتی تێکەڵاوو پێکەڵاو.
**pie** (pī), *n.* = magpie.
**pie** (pī), *n.* پارەیەکی کەم نرخی کۆنی هیندی و پاکستانییە.
**piebald** (pī'bôld'), *adj.* پەڵەپەڵە؛ بەڵەك؛ بازوو؛ ڕەش و سپی *( a ~ horse)*
*n.* ئەسپی بەڵەك؛ گیانداری پەڵەپەڵە
**piece** (pēs), *n.* (١) پارچە؛ بەش. (٢) تیلماسك؛ پل؛ کوت؛ پەنچك؛ ئەخت.
(٣) وێنە؛ نموونە: *( a ~ of nonsense)*
(٤) بەرهەمێکی هونەری (وێژە، مۆسیقا، نیگارکێشی).
(٥) ڕای خۆ؛ ڕا: *( speak one's ~ )*.
(٦) پارە: *( a ten-cent ~ )*.
(٧) داشی شەترەنج. (٨) چەك (بەتایبەتی تفەنگ).
(٩) [Dial.]: ماوەیەکی کورت.
(١٠) [Vulgar Slang]؛ ئافرەت (کە هەر بۆ جووت بوون بێ).
*v.t.* (١) دانەدم؛ خستنەسەر؛ پێکەوە دوورین.
(٢) پینەکردن؛ پێکەوەنان؛ پێکەوە نووساندن.
a piece of one's mind, [Colloq.], ڕای لەڕوو وە نادۆستانە؛ سەرزەنشت؛ قسەی خراپ: *( I gave him a piece of my mind.)*.
go to pieces, (١) پارچە پارچە بوون؛ ڕووخان.
(٢) ڕووخان (مەجان)؛ پەرێشان بوون؛ شێت بوون؛ هەرەس بردن (بەهۆی خوریەو شتی ناخۆشەوە).
of a ( or one ) piece, چوونیەك؛ هەمان چەشن.
speak one's piece, ڕای خۆ دەربڕین؛ دەرخستنی ئەوەی لە دڵدایە؛ دڵ هەڵڕشتن.
**piece-dyed** (pēs'dīd'), *adj.* لە خوم دراو یا بۆیەکراو پاش چنینی.
**piecemeal** (pēs'mēl'), *adv.* پارچە پارچە؛ ئەختە ئەختە؛ وردە وردە نەك بەیەکجاری؛ بەپچڕپچڕی: *( work done ~ )*.
*adj.* وردە وردە کراو؛ پچڕپچڕ؛ ئەختە ئەختە کراو.
**piecework** (pēs'wûrk', *n.* کاری قۆنتەرات بە پارچە پارچە یا دانە دانە.
-pieceworker *(n.)*.
**pied** (pīd), *adj.* (١) پەڵەپەڵە؛ بەڵەك؛ هەمەڕەنگ؛ بازوو.
(٢) جلی وەها لەبەرکردوو.
**piedmont** (pēd'mont), *adj.* لە بناری شاخدایە: *( a ~ stream)*.
*n.* دەشت یا ناوچەی بناری شاخ.
**pieplant** (pī'plant', *n.* ڕێواس.
**pier** (pēr), *n.* (١) پایەی پرد؛ کۆڵەکەی پرد.
(٢) شۆستەی بەندەر؛ شۆستەی درێژبووەوە بۆ ناو دەریا؛ ئەسکەلە.
(٣) پایە (خانووسازی)؛ کۆڵەکە. (٤) دیواری نێوان دوو پەنجەرە یا دەرگا.
**pierce** (pērs), *v.t.* (١) پێداکردن؛ پێدابردن؛ کونکردن؛ بڕین؛ ئەنگاوتن.
(٢) سمین؛ کوناودەرکردن: *( She had her ears ~d.)*.
(٣) بڕین؛ پێداچوون: *( The path ~d the wilderness.)*
(٤) تێدا دەنگدانەوە: *( A shriek ~d the air.)*.
(٥) تێگەیشتن: *( He ~d the heart of the mystery.)*
(٦) کارتێکردن (هەست): *( ~d by anguish)*.
*v.i.* کونکردن؛ پێداچوون.
**piercing** (pēr'siŋ), *adj.* تیژ؛ بڕ.
**Pietà, pietà** (pyā-tä'), *n.* وێنەی مریەم لەکاتی گرتنەباوەشی لاشەی عیسا و شیوەنکردنی بەسەریدا پاش هەڵواسینی (لە پەیکەرو تابلۆدا).
**pietism** (pī'ə-tiz'm), *n.* (١) ترسی خودا؛ خواپەرستی.
(٢) [P-]، بیروباوەڕو ڕێبازی کۆمەڵێکی لە خوداترسی ئەڵمانی سەدەی حەڤدە.
(٣) لە خوداترسی ڕووالەت؛ لە ئەندازە بەدەر خواپەرستی درۆ.
-pietist *(n.)*; pietistic *(adj.)*.
**piety** (pī'ə-ti), *n.* (١) لە خودا ترسان؛ خواپەرستی.
(٢) دڵسۆزی بۆ دایك و باوك و خزم و کەس وکارو خێزان؛ جگەرسۆزی
(٣) کارێکی لە خوداترسانە؛ ووتەی دڵسۆزانە یا لە خوداترسانە.
(٤) [Obs.]، بەزەیی.
**piezometer** (pī'ə-zom'ə-tēr), *n.* پەستان پێوەر.
**piffle** (pif''l), *n.* [Colloq.], شتی هیچوپووچ؛ شتی بێ بایەخ
*v.t.* [Colloq.], قسەی قۆڕ یا هیچوپووچ کردن.
**pig** (pig), *n.* (١) بەراز؛ خووگ؛ ماڵوس. (٢) پەڵخ؛ بەچکە بەراز.
(٣) گۆشتی بەراز. (٤) [Colloq.]، کەسێکی پیس وپۆخڵی بۆگەنی چڵێس
(٥) (ا) پارچەیەك ئاسن یا کانزای تری داڕێژراو. (ب) قاڵبی ئەم دارشتنە.
*v.i.* (١) بەچکە بەراز بوون. (٢) ( ~ it )، بە پیسی وپۆخڵی و چڵێسی ژیان
buy a pig in a poke, شت کڕین لە نەدیدە.
make a pig of oneself, زۆر خواردن؛ زۆرخۆری کردن.
**pig bed,** قاڵبی لمین کە ئاسنی تواوەی تێدا دادەڕێژرێ.

**pigboat** (pig′bōt′), ***n.*** [Navy Slang]. ژێردەریایی؛ کەشتی ژێرئاو

**pigeon** (pij′ən), ***n.*** (١) کۆتر

(٢) [Slang]. کەسێکی ساویلکە یا خۆش باوەڕ.

**pigeon** (pij′in), ***n.*** = pidgin.

**pigeon breast,** دەریۆقینی ئێسکەکۆڵە (تووشی کەسانی سیلاوی دەبێ).

**pigeon-breasted** (pij′ən-bres′tid), ***adj.*** سنگ دەریۆقیو (نەخۆشی)؛ کۆترسنگ.

**pigeon hawk,** واشەی کۆترخۆر

**pigeonhearted** (pij′ən-här′tid), ***adj.*** ترسنۆک

**pigeonhole** (pij′ən-hōl′), ***n.*** (١) کونە کۆتر؛ هێلانە کۆتر.

(٢) تاق؛ خانەی بچووکی مێز؛ چاوی مێز.

***v.t.*** (١) خستنە چاوی مێزەوە. (٢) خستنە پشت گوێ؛ خستنە لاوە.

(٣) ڕیزکردن؛ بە ڕێکوپێکی دانان؛ ڕێکخستن

**pigeon-toed** (pij′ən-tōd′), ***adj.*** پەنجە کۆتری؛ پەنجەی پێی نووشتاوەتەوە بۆ ناوەوە.

**pigfish** (pig′fish′), ***n.*** ماسییەکە دەمرخێنێ کە لە ناو دەردەهێنرێ.

**piggery** (pig′ẽr-i), ***n.*** تەویلەی بەراز

**piggin** (pig′in), ***n.*** دۆلکە یا سەتڵێکی داریني دەسک ستوونییە.

**piggish** (pig′ish), ***adj.*** بەرازخوو؛ پیس‌وپۆخڵ؛ چڵێس؛ سەرسەخت.

**-piggishly** *(adv.)*; **piggishliness** *(n.).*

**piggy** (pig′i), ***n.*** *Also* **piggie,** پەلغ؛ بەچکە بەراز

***adj.*** = piggish.

**piggyback** (pig′i-bak′), ***adv. & adj.*** = pickaback

**piggy bank,** بەرازە باغ؛ دەفرێکە لە شێوەی بەرازدا درزێکی تێدایە پارەی وردەی لێوە تێدەخرێ‌و پاشەکەوت دەکرێ.

**pigheaded** (pig′hed′id), ***adj.*** سەرسەخت؛ کەللەڕەق.

**pig iron,** ئاسنی خاو لەکاتی دەرهاتنی لە کوورەی تواندنەوەدا.

**piglet** (pig′lit), ***n.*** پەلغ؛ بەچکە بەراز.

**pigment** (pig′mənt), ***n.*** (١) (ا) بۆیە؛ ڕەنگ. (ب) پەڵە؛ خاڵ

(٢) ماددەی ڕەنگداری خانەی گیاندارو ڕووەک (وەک کلۆروفیل یا سەوزینە).

**pigmentary** (pig′mən-ter′i), ***adj.*** ڕەنگی؛ بۆیەیی؛ پەڵەیی؛ خاڵاوی

**pigmentation** (pig′mən-tā′shən), ***n.*** (١) ڕەنگ بوون یا ڕەنگ پەیداکردنی ڕووەک‌و گیاندار بەهۆی ڕەنگ تێدابوونی خانەکانیان. (٢) ڕەنگ یا پەڵەی گیاندارو ڕووەک.

**pigmented** (pig′mən-tid), ***adj.*** ڕەنگدار؛ پەڵاوی؛ خاڵدار.

**Pigmy** (pig′mi), ***adj. & n.*** = Pygmy.

**pignus** (pig′nəs), ***n.*** بارمتە (یاسا).

**pigpen** (pig′pen′), ***n.*** (١) تەویلەی بەراز؛ پەچەی بەراز.

(٢) شوێنێکی پیس‌وپۆخڵ.

**pigskin** (pig′skin′), ***n.*** (١) پێستە بەراز. (٢) قایشی پێستە بەراز

(٣) [Colloq.]. تۆپی فوتبۆڵی ئەمەریکی. (٤) [Colloq.]. زین.

**pigsticking** (pig′stik′iŋ), ***n.*** ڕاوە بەراز کردن بە ڕم.

**pigsty** (pig′stī′), ***n.*** = pigpen.

**pigtail** (pig′tāl′), ***n.*** (١) کلافەتووتن.

(٢) پرچی کلافەکراوی بە پشتی ملدا شۆڕبووەوە.

**pika** (pī′kə), ***n.*** گیاندارێکی شیردەری قرتێنەری بێ کلکە لە توخمی کەروێشک

**pike** (pīk), ***n.*** (١) turnpike . (٢) دەرگای باجدان لەسەر ڕێگاوبانی باجی؛ دەرگای ڕێگەنەدان لەسەر ڕێگاوبانی بە پارە پێدا ڕۆیشتوو.

(٣) باجی دراو لەم دەرگایەدا

***v.i.*** [Slang]. ( ~ along ). خێرا ڕۆیشتن؛ بەپەلە پێدا ڕۆیشتن.

**pike** (pīk), ***n.*** ڕم؛ نێزە

***v.t.*** ڕم پێداکردن؛ بە نێزە یا ڕم کوشتن

**pike** (pīk), ***n.*** جۆرە ماسییەکی ڕووباریی لەوز درێژو باریکی کاژێر دەریۆقیوی ددان تیژە.

**pike** (pīk), ***n.*** نووکی ڕم یا نێزە؛ نووکی تیژ.

**pike** (pīk), ***n.*** [British Dial.]. (١) لووتکەی تیژ؛ لووتکەی تیژی شاخ.

(٢) شاخی لووتکە تیژ.

**pikeman** (pīk′mən), ***n.*** سەربازی ڕم هەڵگر؛ ڕم هاوێژ؛ نێزەدار.

**pike perch,** ماسییەکی لەوز درێژو باریکی کاژێر دەریۆقیوی ددان تیژە.

**piker** (pī′kẽr), ***n.*** [Slang]. (١) کەسێکی پارەپیسی هیچ‌وپووچ؛ کەسێکی دەست قووچاوی ترسنۆک. (٢) قومارچی یا پارەبازێکی پووڵەکی‌و بچووک.

**pikestaff** (pīk′staf′, pīk′stäf′), ***n.*** (١) داری نێزە؛ قەدی ڕم.

(٢) داردەستی نووک تیژ؛ داردەستی نووک ئاسنی تیژ.

**pilaf, pilaff** (pi-läf′), ***n.*** پلاو.

**pilaster** (pi-las′tẽr), ***n.*** پایەی لاکێشی؛ کۆڵەکەی لاکێشی.

**pilau, pilaw** (pi-lô′), ***n.*** پلاو.

**pilchard** (pil′chẽrd), ***n.*** ماسییەکی بچووکە لە توخمی " ساردین "

**pile** (pīl), ***n.*** (١) کۆمەڵ؛ تۆپەڵ؛ بەستەک؛ بارستایی.

(٢) لێژنەدار (کە لاشەی لەسەر دەسووتێنرێ).

(٣) خانوویەکی زل؛ کۆمەڵێک خانووی گەورە

(٤) [Colloq.]، ژمارەیەکی زۆر؛ فرە؛ هەندێکی زۆر.

(٥) [Slang]، کۆڵێک پارە؛ پارەیەکی زۆر؛ سامان

(٦) (ا) چەند پەرەیەکی کانزایی جیاجیایە قوماش یا کاغەزی بە ترشەلۆک تەڕکراو دەخرێتە نێوانیانەوە بۆ پێکهێنانی تەزووی کارەبا. (ب) باتری.

(٧) nuclear reactor

***v.t.*** (١) کۆمەڵ کردن؛ کەڵەکەکردن؛ بارستەکردن؛ بەستەک کردن؛ گردکردنەوە؛ هەڵچنین. (٢) لەسەر هەڵچنین؛ لێ بارکردن.

***v.i.*** (١) کۆمەڵ بوون؛ کەڵەکەبوون؛ گردبوونەوە.

(٢) ( ~ in; ~ out ) ؛ بە شێواوی جوڵانەوە؛ بەیەکداهاتن‌و جوڵانەوە بە تێکەڵ‌وپێکەڵی‌و سەر لێ شێواوی؛ بەیەکداکەوتن

**pile up,** کۆکردنەوە؛ خڕکردنەوە؛ کۆبوونەوە؛ کەڵەکەبوون؛ مۆڵ بوون؛ نیشتنە سەریەک.

**pile** (pīl), ***n.*** (١) نەخشێکی چنراوی نەرمی سەر ڕووی قوماش

(٢) تەقەڵ یا قولفەی نەخشێکی وەها. (٣) وردە پەڕ؛ گەندەموو؛ کوڵک؛ نەرمەموو

**pile** (pīl), ***n.*** (١) پایەی کۆنکریت یا پۆڵایی پردو خانوو؛ کۆڵەکەی ئەستوور؛ سنگ؛ مێخ. (٢) نیشانەیەکی پوازیی نووک بەرەوخوارە (دروشمی سوارچاکی).

***v.t.*** (١) کۆڵەکە یا پایەی کۆنکریتی‌و پۆڵایی داکوتان (بۆ پردو خانوو)

(٢) بەهێزکردن یا پاڵپشتی کردن بە پایەو کۆڵەکە

**pileate** (pī′li-it, pil′i-āt′), ***adj.*** (١) کڵاودار (وەک قارچک)

(٢) پۆپنەداری درێژ

**pileated woodpecker,** دارکونکەرەیەکی ئەمەریکی پۆپنە درێژە.

**pile driver ( or engine ),** مەکینەی داکوتانی پایەو کۆڵەکە.

**pileous** (pī′li-əs), ***adj.*** تووکن؛ کوڵکن؛ گەندەمووداوی

**piles** (pīlz), ***n.pl.*** مایەسیری.

**pileum** (pī′li-əm, pil′i-əm), ***n.*** تەوقەسەری باڵندە لە دەنووکەوە هەتا پشت مل.

**pileus** (pī′li-əs, pil′i-əs), ***n.*** (١) تەپلە یا کڵاوی بێ قەراغ.

(٢) کڵاوی قارچک. (٣) **pileum** .

**pilfer** (pil′fẽr), ***v.t. & v.i.*** دزین (بەتایبەتی پارەی کەم یا شتی هیچ‌وپووچ).

**-pilferer** *(n.).*

**pilferage** (pil′fẽr-ij), ***n.*** (١) دزی (بەتایبەتی پارەی کەم یا شتی هیچ‌وپووچ)؛ دزین. (٢) شتی دزراو.

**pilgarlic** (pil-gär′lik), ***n.*** (١) کەسێکی سەر ڕووتاوە

(٢) کەسێکی بە چاوی سووک تەماشاکراو؛ کەسێکی داماو کە جێی بەزەیی

پێدا هاتنەوەی خەڵك بێت

**pilgrim** (pil′grim), *n.* (١) گەڕوك؛ گەڕیدە؛ ڕەوەند؛ وێڵ. (٢) حاجی.
(٣) [P-] یەکێکە لەو کۆچەرە ئینگلیزانەی کە لە ساڵی ١٦٢٠ دا یەکەم ئاوایی‌یان لە ئەمەریکا داناو ناویان نا " پلیمەس "

**pilgrimage** (pil′grə-mij), *n.* (١) حەج؛ حەج کردن؛ چوون بۆ شوێنێکی پیرۆز. (٢) کەشتێکی دوورودرێژ.

**piliferous** (pi-lif′ẽr-əs), *adj.* تووکاوی

**piling** (pil′iŋ), *n.* (١) پایەو کۆڵەکە داکوتان. (٢) پایەکان؛ کۆڵەکەکان.
(٣) خانوویەت یا شتێکی لەسەر پایە دروستکراو؛ شتێکی لە پایەو کۆڵەکە دروستکراو

**pill** (pil), *n.* (١) حەب (دەرمان).
(٢) شتێکی ناخۆشە کە مرۆڤ ناچارە بیکات یا پێی ڕازی بێت.
(٣) [Slang]. تۆپی بێسبۆڵو گۆڵف.
(٤) [Slang]. کەسێکی ووشك یا بەدسرووشتو بێزارکەر.

*v.t.* (١) دەرمان بەش بەش کردن بە شێوەی حەب. (٢) کردن بە حەب.

**pill** (pil), *v.t. & v.i.* (١) [Archaic]. تالانکردن.
(٢) [Archaic or Dial.]. پاکردن (میوە)؛ توێکڵ لێکردنەوە.
(٣) [Obs.]. سەر ڕووتانەوە؛ سەر ڕووتاندنەوە

**pillage** (pil′ij), *n.* (١) تالانکاری؛ ڕاووڕووت؛ تالانکردن؛ تالان
(٢) تالانی؛ شتومەکی تالانکراو

*v.t. & v.i.* (١) تالانکردن؛ ڕاووڕووت کردن. (٢) بردن بە تالانی

**pillar** (pil′ẽr), *n.* (١) کۆڵەکە؛ دنگە؛ دیرەك؛ پایە
(٢) پەیکەرێکی یادگاری لە کۆڵەکە دروستکراو. (٣) شتێکی لە کۆڵەکە چوو.
(٤) کەسێکە کە وەك کۆڵەکەی دەستگایەك یا کۆمەڵگایەك وایە؛ پشتیوان؛
*( the ~s of society)*

*v.t.* کۆڵەکە دانەبەر؛ پتەوکردن؛ بەهێزکردن بە کۆڵەکە یا پایە.

**from pillar to post,** لە تەنگوچەڵەمەیەکەوە بۆ یەکێکی تر؛ ڕافڕێنراو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر؛ لە بارێکی ناخۆشەوە بۆ یەکێکی تر.

**pillar box,** [British]. سندوقی پۆستە

**pillbox** (pil′boks′), *n.* (١) شووشەی حەب. (٢) سەنگەر
(٣) ئەیلەی نوولەکی پۆپە تەختی ژنانە

**pill bug,** خلێرد؛ مێروویەکە لە هەزارپێ دەچێ ئەگەر دەستی لێ بدرێت خۆی خڕ دەکات وەك تۆپ

**pillion** (pil′yən), *n.* (١) دۆشەکەڵەی پاشکۆی زین (بۆ کەسێك کە لە پاشکۆی سوارەوە سوار دەبێت بەتایبەتی بۆ ئافرەت. (٢) زینی پاشکۆی زینی ماتۆرسکیل

**pillory** (pil′ə-ri), *n.* چوارچێوەی سزادان؛ چوارچێوەیەکە شوێنی دەستو سەری تێدایە لە کۆندا تاوانکاری پێوە دەبەسترایەوە لەبەرچاوی خەڵك بۆ شکاندن و سزادانی

*v.t.* (١) خستنە چوارچێوەیەکی وەهاوە بۆ سزادان
(٢) ئابڕووتکاندن؛ بەدناوکردن؛ ڕوو هەڵماڵین بۆ گاڵتەپێکردن

**pillow** (pil′ō), *n.* (١) سەرین؛ پشتی؛ باڵیف
(٢) دۆشەکەڵەی تەختێنراو. (٣) پاڵپشت

*v.t.* (١) سەر خستنەسەر سەرین؛ سەرنانە سەر سەرین. (٢) بۆ بوون بە سەرین

*v.i.* سەرکردنە سەر سەرین

**pillowcase** (pil′ō-kās′), *n.* بەرگی سەرین؛ بەرگی پشتی

**pillowslip** (pil′ō-slip′), *n.* pillowcase.

**pilose** (pi′lōs), *adj.* تووکن؛ بەتایبەتی هی نەرمو وورد؛ تووکاوی

**pilot** (pī′lət), *n.* (١) لێخوڕی ڕێبەری کەشتی لە بەندەردا
(٢) فڕۆکەوان؛ فڕۆکەچی. (٣) ڕابەر؛ چاوساغ؛ ڕێبەر
(٤) دەمەری ڕێکوپێککەری مەکینە. (٥) pilot light

*v.t.* (١) ڕێبەری کردن؛ پێشاندان؛ ڕێبەری کردن
(٢) فڕۆکە فڕاندن؛ فڕۆکە لێخوڕین؛ کەشتی ڕاندن

*adj.* (١) ڕابەر؛ ڕێ پیشاندەر
(٢) تایبەتی بە بەرنامەیەکی بچووکی تاقیکردنەوەیی *( a ~ program)*.

**pilotage** (pī′lət-ij), *n.* (١) ڕاندن؛ لێخوڕین.
(٢) کرێی ڕابەرو فڕۆکەوانو ڕانەری کەشتی.

**pilot ballon,** باڵۆنی دیاریکردنی خێرایی و ڕووی هەڵکردنی با.

**pilot burner,** = pilot light.

**pilot engine,** مەکینەی ڕابەر؛ مەکینەیەکە لەپێش شەمەندەفەرەوە دەنێررێت بۆ ئەوەی بزانرێ کە هێڵی ئاسنەکە تەواوە یا نا.

**pilothouse** (pī′lət-hous′), *n.* ژووری ڕانەری کەشتی.

**pilot lamp,** گڵۆپی ڕابەر؛ (أ) گڵۆپێکە جێی گوڕەری کارەبایی یا دەستگای بڕینی تەزووی کارەبایی پیشان دەدات. (ب) گڵۆپێکە پیشانی دەدات کە تەزووی کارەبایی کاربکات یا نا

**pilot light,** (١) مۆمی فڕن؛ تروسکەیەکی هەمیشە داگیرساوە لە فڕنی گازدا بۆ داگیرساندنی فڕنەکە هەرکات ویسترا.
(پێشی دەووترێ: " pilot burner " ) (٢) pilot lamp.

**pilular** (pil′yoo-lẽr), *adj.* لە حەب دەچێ؛ هی حەب؛ وە حەب.

**pilule** (pil′ūl), *n.* حەبی بچووك

**pimento** (pi-men′tō), *n.* (١) pimiento.
(٢) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە ئاڵەتی شیرین لە بەرەکەی دەردەهێنرێ؛ ئاڵەتی شیرین

**pimiento** (pi-myen′tō), *n.* جۆرە بیبەرێکی شیرینە.

**pimola** (pi-mō′lə), *n.* زەیتوونی بیبەری شیرین تێکراو.

**pimp** (pimp), *n.* گەواد؛ کەشیش؛ قەحبەچی.

*v.i.* گەوادی کردن؛ کەشیشی کردن.

**pimpernel** (pim′pẽr-nel′, pim′pẽr-nəl), *n.* ڕووەکێکە گوڵی سوورو سپی و شینی ئەستێرەیی دەگرێت و لە ئاووهەوای ناخۆشدا گوڵەکەی دادەخات.

**pimping** (pim′piŋ), *adj.* (١) بێ بایەخ؛ هیچوپووچ؛ ناگرنگ.
(٢) لاواز؛ جیقن؛ دەردەدار

**pimple** (pim′p'l), *n.* دوومەڵ؛ پیزۆکە؛ قنچکە؛ زیپکە.

**pimpled** (pim′p'ld), *adj. Also* **pimply,** دوومەڵاوی؛ پیزۆکاوی؛ زیپکەدار.

**pin** (pin), *n.* (١) سنگ؛ مێخ؛ چوقول؛ دووگمە.
(٢) شتێکی هیچوپووچ و بێ نرخ.
(٣) (أ) دەرزی؛ دەرزی سەرخڕ؛ دەرزی سنجاق. (ب) تەوقەی سەر.
(ج) گیرەی جل. (د) یەخەبەند. (هـ) بزمار. (٤) (*pl.*) [Colloq.]. لاق
(٥) نیشانێکی دارینە لە گۆزەڵە دەچێ بۆ نیشان لێگرتنەوە (یاری بۆلینگ).
(٦) دووگمەی پیانۆو ئامێری مۆسیقایی تر. (٧) قولاپ (کەشتی‌یەوان)
(٨) دارئاڵا (کە کونەکانی گۆڕەپانی یاری گۆڵف نیشانە دەکات).

*v.t.* (١) پێکەوە نووساندن؛ لێکدان (بە دەرزی یا سنگ... هتد)؛ پێکەوە بەستن؛ دەرزی لێدان. (٢) دەرزی پێداکردن. (٣) بەستنەوە؛ ڕاگرتن لە یەك شوێندا؛ چەسپاندن. (٤) ( ~ on )، هیوا پێ بوون.
(٥) [College Slang]، نیشانەکردن؛ دیاریکردن (دەستگیران).

**on pins and needles,** بێ ئارام؛ سرەوت نەگر؛ بەپەرۆش؛ دڵی لەسەر دەرزی دانیشتووە؛ دڵی بەسەر دڕکەوەیە.

**pin one down,** وا لە کەسێك کردن کە چی لە دڵیدایە بیڵێت بەبێ پێچوپەنا؛ بەستنەوەی کەسێك بە ڕایەك یا بەڵێنێکەوە؛ بە نیمچە زۆرەملێ بەڵێن یا قسەی تەواو لێ وەرگرتن.
*( He's hard to pin down on money matters.)*

**pin (something) on one,** [Colloq.]. خستنەپاڵ (تاوان، بەدکاری)؛ دانەپاڵ؛ پێوەنووسان؛
*( The murder was pinned on the wrong man.)*

**pinaceous** (pi-nā′shəs), *adj.* سنەوبەری؛ هی توخمی دارسنەوبەر.

**pinafore** (pin′ə-fôr′, pin′ə-fōr′), *n.* بەرگێکی منداڵانە لە بەروانکە دەچێت.

**pinaster** (pi-nas′tẽr, pi-nas′tẽr), *n.* سنەوبەری ناوچەی دەریای ناوەڕاست.

**pinball** (pin′bôl′), *n.* یاریەکە بە سنووقێکی لێژ دەکرێت کە پێی دەووترێ " **pinball machine** " بریتییە لە لێدانی تۆپێك بەسەر ڕووی مەکینەیەکدا کە پڕە لە چوقوڵی بچووك و نیشان

**pincers** (pin′sẽrz), *n.pl.* (١) گاز (٢) چنگ یا چڕنووکی قرژاڵ (٣) **pincers movement**.

**pincers movement,** مناوەرەیەکی سوپایییە بریتییە لە هێرش بردنە سەر دوژمن لە دوو لاوەو لە پێشەوە

**pinch** (pinch), *v.t.* (١) چڕنووك گرتن
(٢) گوشین یا گرتن و ئازاردان (پێڵاو) (٣) ئازاردان؛ ناڕەحەت کردن.
(٤) لاوازکردن؛ ووشك کردنەوە (بە برسێتی یا ئازاردان).
(٥) تەنگ پێ هەڵچنین (٦) [Slang]، دزین
(٧) [Slang]، گرتن (بەند)؛ پەلاماردان (لەلایەن پۆلیسەوە).
(٨) بەتەنیشت باوە کەشتی ڕاندن

*v.i.* (١) چڕنووك گرتن؛ گوشین و ئازاردان (٢) پیسکەیی کردن؛ ڕەزیلی کردن.
(٣) تەسك بوونەوە

*n.* (١) چڕنووك؛ چڕنووك گرتن.
(٢) سرووش؛ ئەختێك؛ تۆزێك: *( a ~ of salt)*
(٣) بارێکی ناخۆش و بەئازار؛ دژواری؛ ناخۆشی: *( to feel the ~ )*.
(٤) ناکاوی؛ تەنگانە (٥) [Slang]، دزی
(٦) [Slang]، گرتن (بەند)؛ هێرشی پۆلیس

**pinch bar,** نوێلی نووك تیژ

**pinchbeck** (pinch′bek), *n.* (١) داڕێژەی مس و چینکۆ (بۆ خشڵی هەرزانبەها دروستکردن) (٢) شتی هەرزانبەها.

*adj.* (١) لە داڕێژەی مس و چینکۆ دروستکراو (٢) هەرزانبەها.

**pinchers** (pin′chẽrz), *n.pl.* pincers.

**pinch-hit** (pinch′hit′), *v.i.* (١) لێدانی تۆپ لە ناچاری یا ناکاویدا لەباتی یاریکەرێکی تر (یاری بیسبۆڵ)
(٢) جێگری کەسێکی تر کردن لە ناکاوی یا ناچاریدا

**-pinch-hitter** *(n.).*

**pincushion** (pin′koosh′ən), *n.* دەرزی دان کوشنێکی زۆر بچکۆلەیە دەرزی پێوە دەکرێت

**Pindaric** (pin-dar′ik), *adj.* (١) لەسەر شێوازی هۆنەری یۆنانی کۆن "پیندار" (٢) ڕێك و پێك (هۆنراوە).

**pindling** (pin′dliŋ), *adj.* [Dial.]. بچووك؛ لاواز؛ جیقن؛ هیچ و پووچ.

**pine** (pīn), *n.* (١) سنەوبەر؛ دارسنەوبەر؛ کاج (٢) داروتەختەی سنەوبەر
(٣) [Colloq.]. pineapple

**pine** (pīn), *v.i.* (١) پووکانەوە (لە برسێتی یا داخ و خەفەتدا):
*( He's ~ing with hunger.)*
(٢) (~ for)، خۆزگە بۆ خواستن؛ بۆ بەپەرۆشەوە بوون؛ بۆ بەتاسەوە بوون؛ زۆر حەزلێکردن:
*( He is ~ing for a vacation.; I am ~ing for her.)*

*v.t.* [Archaic], شیوەن بۆ کردن؛ خەفەت بۆ خواردن.

*n.* [Archaic], چەوسانەوە؛ داخ و خەفەت؛ تاس

**pineal** (pin′i-əl), *adj.* (١) شێوە سنەوبەری؛ قووچەکی وەك بەری کاج.
(٢) هی لووی سنەوبەری (ووشەی دوایی ببینە).

**pineal body,** لووی سنەوبەری لوویەکی قووچەکی بچووکی کار بەرانبەر وە لە مێشکی بڕبڕەدارەکاندا (پێشی دەووترێ: " **pineal eye** " و " **pineal gland** ")

**pineapple** (pīn′ap′l), *n.* (١) ئەناناس؛ ڕووەکێکی ناوچە گەرمەکانی ئەمەریکایە بەرێکی گۆشتن و ئاوداری قووچەکی دەگرێ گەڵاکانی درێژ و تیژن.
(٢) بەری ئەم ڕووەکە (کە ئەوەندەی کاڵەکێکی مام ناوەندی دەبێ).
(٣) [Slang]. بۆمبای دینامیتی دەستی؛ نارنجۆك.

**pine cone,** بەری قووچەکی سنەوبەر

**pine needle,** دەرزی سنەوبەر؛ گەڵای وەك دەرزی باریك و تیژی سنەوبەر.

**pinery** (pīn′ẽr-i), *n.* (١) دارستانی سنەوبەر
(٢) شەتڵگای ئەناناس؛ باخی ئەناناس

**piney** (pīn′i), *adj.* = piny.

**pinfeather** (pin′feth′ẽr), *n.* پەڕی تازە (کە بە ئاستەم سەری دەرهێناو لە پێستەوە).

**pinfold** (pin′fōld′), *n.* تەویلەی گیانداری بەرەڵا و وون بوو (بەتایبەتی سەگ و پشیلە)

*v.t.* ڕاگرتن؛ بەستنەوە؛ خستنە تەویلەوەو هێشتنەوە

**ping** (piŋ), *n.* گیزە یا گڤەی گوللە.

*v.i. & v.t.* گیزەهاتن.

**ping-pong** (piŋ′poŋ′, piŋ′pôŋ′), *n.* یاری تۆپی سەر مێز؛ پینگ پۆنگ.

**pinhead** (pin′hed′), *n.* (١) سەرەدەرزی.
(٢) شتێکی بچووك و هیچ و پووچ. (٣) کەسێکی بێ مێشك.

**-pinheaded** *(adj.).*

**pinhole** (pin′hōl′), *n.* کونی زۆر بچووك (وەك بە دەرزی کرابێ).

**pinion** (pin′yən), *n.* پێچکەی بچووکی داندار (کە ددانەکانی گیردەبن لە ددانی پێچکەیی گەورەتر لەکاتی خوولانەوەدا).

**pinion** (pin′yən), *n.* (١) باڵ. (٢) سەرباڵ؛ شاباڵ. (٣) شاپەڕ؛ پەڕ.

*v.t.* (١) باڵ کردن؛ پەڕو باڵ قرتاندن (٢) باڵ بەستن (باڵندە).
(٣) باڵ بەستنەوە؛ بەستنەوە؛ پێوەندکردن؛ جووڵە لێ بڕین.

**pink** (piŋk), *n.* (١) مێخەك. (٢) گوڵە مێخەك.
(٣) مێخەکی؛ ڕەنگی مێخەك؛ ڕەنگی پەمەیی. (٤) پلەی نایاب؛ چەشنی نایاب؛ نایابی. (٥) [British]، چاکەتی سووری ڕاوکەری ڕێوی.
(٦) [British]، ڕاوکەری ڕێوی. (٧) کەسێکی شیوعی، سوور، یا چەپڕەو (لەڕووی سووکییەوە).

*adj.* (١) پەمەیی؛ مێخەکی (٢) ئەختێك سوور یا چەپڕەو.

**pink** (piŋk), *v.t.* (١) پێداکردن (تیغ، چەقۆ، نێزە... هتد).
(٢) ڕازاندنەوەی جل بە نەخشی قەراغ گرنج گرنج. (٣) قوماش بڕین بە مقەستی گرنج گرنج تا قەراغەکەی گرنج گرنج دەرچێ. (٤) ڕازاندنەوە

**pink** (piŋk), *n.* کەشتی دوا باریك.

**pinkeye** (piŋk′ī′), *n. Also* **pink eye,** هەوکردن و سووربوونەوەی چاو

**pinkie** (piŋk′i), *n. Also* **pinky,** پەنجە تووتە؛ پەنجە بچکۆلە.

**pinking shears,** مقەستی گرنج گرنج (کە شتی پێ دەبڕی قەراغەکەی گرنج گرنج دەردەچێ).

**pinkish** (piŋk′ish), *adj.* ئەختێك پەمەیی؛ مەیلەو پەمەیی.

**pinko** (piŋ′kō), *n.* [Slang]. کەسێکی چەپڕەو یا سوور.

**pinky** (piŋk′i), *n.* = pinkie.

**pinky** (piŋk′i), *n.* کەشتی دوا باریك.

**pin money,** (١) پارەی وردە خەرجی کە مێرد دەیدات بە ژنەکەی.
(٢) وردە خەرجی.

**pinna** (pin′ə), *n.* (١) کرکراگەی گوێ
(٢) گەڵایەکی بچکۆلەیە کە لەگەڵ چەند گەڵایەکی بچکۆلەی تردا بە ڕیز بە لاسکە گەڵایەکەوە بێ (٣) پەڕ؛ باڵ؛ پەڕەی ماسی.

**pinnace** (pin′is), *n.* (١) بەلەمێکی بایەوانییە بۆ بەکارهێنان لەنێوان کەشتی و قەراغ دەریادا. (٢) بەلەمی کەشتی (بۆ جێبەجێکردنی کاروباری کەشتییەکە بەکاردەهێنرێ).

**pinnacle** (pin′ə-k'l), *n.* (١) قوللە یا بورجێکی نووك تیژ
(٢) لووتکە؛ پۆپە؛ قووتکە. (٣) ئەوپەڕ؛ تاف؛ ئەوپەڕی بڵندی؛ بەرزترین شوێن: *( the ~ of power)*

*v.t.* (١) قوللەی سەر تیژ بۆ کردن (٢) خستنەسەر لووتکە.
(٣) بوون بە لووتکە یا پۆپە

**pinnate** (pin′āt, pin′it), *adj. Also* **pinnated,** (١) پەڕی؛ شێوەی لە پەڕ دەچێ (٢) وردە گەڵا بە ڕیز بە هەردوو دیوی لاسکەکەیەوەیە وەك پەڕ.

**pinner** (pin′ẽr), *n.* (١) حۆرە کلاویکی ژنانەی کۆنە دوو چمك لەم دیوو
لەو دیوبەوە شۆربووەتەوە. (٢) بکەری " pin "
**pinniped** (pin′i-ped′), *adj.* تایبەتی بە گیاندارانی ناوی قاچ
بەردکەیی وەك مانگای دەریاو شێری دەریا
*n.* گیانداری ری قاچ پەردکەیی
**pinnula** (pin′yoo-lə), *n.* = pinnule.
**pinnule** (pin′ūl), *n.* (١) یەکێکە لەو وورده گەلاًیانەی کە بە ریز
بە هەردوو دیوی لاسکە گەلاًیەکەوەن وەك پەر. (٢) پەرەکی زۆر بچووکی هەندێ
گیانداری ئاوی
-pinnular *(adj.)*.
**pinochle, pinocle** (pē′nuk′l), *n.* یارییەکی کاغەرە.
**piñon** (pin′yən. pēn′yōn), *n.* (١) حۆرە دارسنەوبەرێکە بەرەکەی
دەخوری (٢) بەر یا دەنکی ئەم دارە
**pinpoint** (pin′point′), *v.t.* (١) نیشانەکردن بە دەرزی پێداکردن
وەك شوێنێك لەسەر نەخشە؛
(٢) دەستنیشانکردن؛ پەنجە خستنەسەر؛ بەووردی و تەواوی نیشانەکردن:
***( Our radar ~ed the attacking planes.)***
(٣) بەووردی نیشان لێگرتن
*n.* (١) سەری دەرزی. (٢) شتی هیچ‌وپووچ و بچووك و بێ بایەخ.
*adj.* (١) وورد و تەواو؛ بێ زیادوکەم ***( ~ bombing)*** .
(٢) بچووك
**pins and needles,** مێروولەکردن
**pin stripe,** (١) میلی قوماش. (٢) قوماشی میلدار؛ دەستەجلی میلدار.
-pin striped *(adj.)*.
**pint** (pīnt), *n.* پاینت پێوانەیەك و سەنگێکە بریتییە لە هەشت یەکی
گالۆنێك (بۆ شلە و شتی ووشك). (ب) دەفرێکی یەك " پاینت " ی
**pinta** (pin′tə), *n.* نەخۆشییەکی بەپزکی پێستە دەبێتە هۆی پەیدابوونی
پەڵەپەڵە بەسەر پێستەوە
**pintado** (pin-tä′dō), *n.* جۆرە ماسییەکی درێژکۆلەیە پەڵەی قاوەیی
پێوەیە
**pintail** (pin′tāl′), *n.* (١) حۆرە مراوییەکی مل درێژی سك سپییە
پەرەکانی ناوەراستی کلکی درێژن. (٢) جۆرە مریشکەکێوییەکی کلك درێژە.
**pintle** (pin′t'l), *n.* تەوەرەی ستوونی
**pinto** (pin′tō), *adj.* بازوو؛ پەڵەپەڵە بەڵەك؛ خاڵ خاڵ.
*n.* (١) ئەسپی بەڵەك یا خاڵ خاڵ. (٢) **pinto bean** .
**pinto bean,** جۆرە فاسولیایەکی قاوەیی خاڵ خاڵە.
**pin-up** (pin′up′), *adj.* (١) بە دیواردا هەڵواسراو؛
بە دیواردا هەڵدەواسرێ ***( a ~ lamp)*** . (٢) [Slang]. تایبەتی بە کچێکە
کە ئەوەندە جوانە وێنەکەی بە دیواردا هەڵدەواسرێ
*n.* [Slang]. کچێکە ئەوەندە جوانە وێنەکەی بە دیواردا هەڵدەواسرێ؛
وێنەیەکی بە دیواردا هەڵواسراو
**pinworm** (pin′wûrm′), *n.* کرمی دەرزیلەیی کرمێکی بچووکە لە
ریخۆڵە ئەستوورە و کۆمدا دەژی
**piny** (pīn′i), *adj. Also* piney, (١) پڕە لە سنەوبەر؛ بە دارسنەوبەر
داپۆشراو (٢) سنەوبەری؛ وەك سنەوبەر وایە
**pioneer** (pī′ə-nēr′), *n.* (١) ئەندازیاری سوپایی ری ئامادەکەر
لەبەردەمی سوپاوە بە درووستکردنی پرد و رێگە کردنەوە... هتد.
(٢) رابەر؛ پێشەنگ؛ پێشرەو (وەك زانایەکی شتی تازە داهێنەر، کەسێکی
چۆڵەوانی ئاوەدانکەرەوە... هتد)؛ رێ ئامادەکەر: ***( a ~ in aviation)***
*adj.* (١) تایبەتی بە رابەر و رابەری؛ هی داهێنەر؛ یەکەمین ***( a ~ chemist)*** .
(٢) هی ئەوانەی چۆڵەوانییان ئاوەدان کردەوە و چەرخەکەیان (وەك ئەوانەی
ئەمەریکایان ئاوەدان کردنەوە بەتایبەتی رۆژاوای ئەمەریکا) ***( the ~ spirit)*** .
*v.t.* (١) (ا) دۆزینەوە (ناوچەی تازە). (ب) ئاوەدانکردنەوەی شوێنی تازە و
چۆڵەوانی (٢) رابەری کردن؛ داهێنان؛ پێشرەوی کردن.
**piosity** (pī-os′ə-ti), *n.* لە خوداترسانی درۆ؛ لە خوداترسی رووالەت

**pious** (pī′əs), ***adj.*** (١) لە خوداترس؛ خواپەرست؛ خواناس؛ زۆر بە ئاین.
(٢) (ا) ئاینی. (ب) پیرۆز (٣) (ا) لە خوداترس بە درۆ؛ هەر بە درۆ بە ئاین
(ب) ئەنجامی بە رووالەت لە خوداترسییەوە.
(٤) [Archaic]. دڵسۆز بۆ دایك و باوك و خزم و کەس‌وکار.
**pip** (pip), *n.* (١) ئاووك (سێو، هەرمێ، پرتەقاڵ)؛ دەنك.
(٢) [Slang]، کەسێك یا شتێکی زۆر پەسەندکراو.
**pip** (pip), *n.* خاڵی سەر کاغەزی قومارو پووڵی دۆمینەو زاری تاولە
**pip** (pip), *v.i.* جریوەجریوکردن.
*v.t.* لە قاوغی هێلکە هاتنە دەرەوە (جووجەڵەو بێچووی باڵندە).
**pip** (pip), *n.* (١) وەناقی مریشك (نیشانەکانی قەتماغەکردنی زمان و ئاو
لە دەمەوە هاتنە)؛ باڵەشۆرێ (٢) نەخۆشییەکی سووکی مرۆڤ (لەرووی
گاڵتەوە).
**pipage** (pip′ij), *n.* (١) ئاوو نەوت و گاز گواستنەوە بە بۆری.
(٢) کرێی ئەم گواستنەوەیە (٣) سەرجەمی بۆری پێکەوە بەستراو بۆ ئەم
مەبەستە
**pipe** (pīp), *n.* (١) شمشاڵ؛ جووزەلە؛ زورنا؛ بلوێر.
(٢) (ا) شاووری سەرکاری کەشتییەوان. (ب) دەنگی ئەم شاوورە.
(٣) دەنگی گۆرانی. (٤) جریوە؛ جریوەجریو؛ خوێندنی باڵندە.
(٥) بۆری (٦) بۆری ناو لەش (بەتایبەت هی هەناسەدان).
(٧) شتێك کە شێوەی لە بۆری بچێ.
(٨) (ا) سەبیل؛ قلیان؛ قەندە (ب) پڕ سەبیلێك تووتن
(٩) بەرمیلێك مەی یا شلەی تر (١٢٦) گاڵۆن دەگرێ.
(١٠) پێوانەیەکی (١٢٦) گاڵۆنی
(١١) [Slang]: کارێکی ئاسان؛ شتی ئاسان.
*v.i.* (١) شمشاڵ لێدان؛ بلوێر ژەندن؛ جووزەلە لێدان.
(٢) هاوارکردن؛ زیقەزیق کردن. (٣) شاوورلێدان (کەشتییەوانی)
*v.t.* (١) شمشاڵ لێدان؛ بلوێر ژەندن؛ جووزەلە لێدان.
(٢) هاوارکردن؛ زیقەزیق کردن
(٣) کارتێکردن (وەك بە زورنا بۆ لێدان)؛ والێکردن (بە شمشاڵ لێدان).
(٤) ئاوو نەوت و گاز گواستنەوە یا بۆ بردن بە بۆری.
(٥) بۆری راکێشان.
(٦) شاوور بۆ لێدان و کۆکردنەوە (کەشتییەوانی).
pipe down, [Slang]. بێ دەنگ بوون؛ دەنگ نزم کردنەوە.
pipe up, (١) دەست بە شمشاڵ یا زورنا لێدان کردن؛
دەست بە گۆرانی ووتن کردن. (٢) دەنگ بەرزکردنەوە؛ زیقەزیق کردن
**pipe clay,** گڵی سپی.
**pipe dream,** [Colloq.]. خەیاڵ پڵاو؛ خەون؛ ئومێدی بۆش و هەرگیز
نەهاتەدی.
**pipefish** (pīp′fish′), *n.* بۆرییە ماسی: ماسییەکی لە بۆری چووی
پووڵەکە رەقی لموز درێژە
**pipe-fitting** (pīp′fit′iŋ), *n.* (١) (ا) بۆری بەستن.
(ب) بۆری دانان و چاکردن؛ بۆریکاری. (٢) قوڵ یا پارچە بۆرییەکی بچووکە
دوو بۆری تری پێ لێکدەدرێ.
-pipe-fitter *(n.)*.
**pipeful** (pīp′fool′), *n.* پڕ سەبیلێك تووتن.
**pipe-line** (pīp′līn′), *v.t.* (١) گواستنەوە بە بۆری (ئاو، نەوت، گاز)؛
بە بۆری بۆ بردن. (٢) بۆری بۆ راکێشان.
**pipe line,** (١) بۆری (بۆ ئاوو نەوت و گاز راکێشان)؛ هێڵی بۆری.
(٢) هۆی گەیاندن، گواستنەوە، یا بردن: ***( a ~ of information)***
**pipe of peace,** = calumet.
**pipe organ,** ئامێرێکی مۆسیقییە لە بابەتی پیانۆ.
**piper** (pīp′ẽr), *n.* بلوێرژەن؛ زورنالێدەر؛ شمشاڵژەن.
pay the piper, سەرانەی خۆ دان؛ شاباشی خۆ دان؛
ئەنجامی کردەوەی خۆ هاتنەوە رێ و هەڵگرتنی.
**pipestone** (pīp′stōn′), *n.* بەردی سەبیل: هیندییە ئەمەریکاییەکان

قلیانیان لێ دروست دەکرد

**pipette, pipet** (pī-pet′, pi-pet′), ***n.*** مژۆك؛ بۆرییەكی شووشەی پلە پلە كراوی بچووكە شلەی پێ دەگوێزرێتەوە لە دەفرێكەوە بۆ دەفرێكی تر (كیمیاكەری)

**piping** (pīp′iŋ), ***n.*** (١) شمشاڵ ژەندن؛ بلوێر ژەندن؛ زورنا لێدان (٢) دەنگی شمشاڵ، بلوێر یا زورنا (٣) زیقە (٤) كۆمەڵێك بۆری پێكەوە بەستراوە (٥) ماددەی بۆری لێ دروستكراو (٦) هێڵی شیرینی بەسەر كێكەوە (٧) تیلماسكی رازانەوەی پەراوێزی جل.

***adj.*** (١) زورنالێدەر؛ نای لێدەر؛ بلوێرژەن (٢) تایبەتی بە دەنگو ئاوازی هێمن و خۆشی ئاشتییانەی شمشاڵ و نای. (٣) پڕ ئاسوودەیی؛ هێمن (٤) زیقەزیق.

***adv.*** چزەچزكەر؛ كسپە ئێوەهاتن؛ داغ؛ (*~ hot*) .

**pipit** (pip′it), ***n.*** باڵندەیەكی بچكۆلەیە لە كلاوكورە دەچێ

**pipkin** (pip′kin), ***n.*** (١) دەفری گلینە؛ مەنجەل، قابلەمە، قوری. (٢) piggin

**pippin** (pip′in), ***n.*** (١) جۆرە سێوێكی مزری سەوزە (٢) ناوك (رووەكناسی)؛ دەنك (٣) [Slang] كەسێك یا شتێكی زۆر پەسەندكراو.

**pipsqueak** (pip′skwēk′), ***n.*** كەسێك یا شتێكی بچووك و بێ بایەخ و هیچ و پووچ

**pipy** (pīp′i), ***adj.*** (١) لە بۆری دەچێت (٢) دەنگ تیژو ناساز؛ زیقەزیقاوی

**piquancy** (pē′kən-si), ***n.*** مزری؛ تیژی؛ مێشك حوولێن؛ سەیری و خۆشی

**piquant** (pē′kənt), ***adj.*** (١) مزر؛ مێخوش (٢) مێشك حوولێن؛ سەیرو خۆش (٣) [Archaic] تیژ؛ بڕ؛ بڕندە

**pique** (pēk), ***n.*** توڕان؛ تۆرین؛ پەستی و تووڕەیی بەهۆی هەست بریندارکردن یا شكاندنەوە.

***v.t.*** (١) توڕاندن؛ پەستو تووڕەكردن بە هەست بریندارکردن یا شكاندن. (٢) جوولاندن؛ مێشك و هەست؛ (*The portrait ~d my curiosity.*) . (٣) شانازی پێوەكردن؛ خۆ پێوە بادان

**pique oneself on** ( or **upon** ), شانازی پێوەكردن؛ خۆ پێوە بادان

(*They piqued themselves on their modish attire.*)

**piqué** (pi-kā′), ***n.*** جۆرە قوماشێكی سفتی لۆكەیە

**piquet** (pi-ket′), ***n.*** یارییەكی كاغەزی دووكەسییە

**piracy** (pī′rə-si), ***n.*** (١) چەتەیی دەریا؛ چەتەكاری دەریا. (٢) دزینی داهێنان یا بەرهەمی زانستی و هونەری یەكێكی ترو كردن بە هی خۆ؛ چاپكردن و بڵاوكردنەوەی بەرهەمی نووسەر یا زانایەك بەبێ پرسی خاوەنەكەی.

**piragua** (pi-rä′gwə, pi-rag′wə), ***n.*** (١) بەلەمێكی سەوڵی بچووكە بە هەڵكەندنی دارێكی ئەستوورو زل دروست دەكرێ (٢) بەلەمێكی بابەوانی بن تەختە

**piranha** (pi-rän′yə), ***n.*** جۆرە ماسییەكی بچووكی چاوبرسی درە هێرش دەباتە سەر گیانداری ناوی گەورەو تەنانەت بۆ سەر مرۆڤیش.

**pirate** (pī′rit), ***n.*** (١) چەتەی دەریا (٢) كەشتی چەتەی دەریا

***v.i. & v.t.*** (١) چەتەیی كردن لە دەریادا؛ رووتكردنەوە لە دەریادا (٢) بڵاوكردنەوە یا بەكارهێنانی بەرهەمێكی وێژەیی یا زانستی بەبێ پرسی خاوەنەكەی و بە پێچەوانەی پەیرەوی بەڵگەنامەی داهێنان

**-piratic; piratical** (*adj.*); **piratically** (*adv.*).

**pirogue** (pi-rōg′), ***n.*** بەلەمێكی سەوڵی بچووكە بە هەڵكەندنی داری ئەستوورو زل دروست دەكرێ

**pirouette** (pir′ōō-et′), ***n.*** خوولانەوە لەسەر پەنجەی پێ یا لەسەر یەك پێ (سەمای باڵێ)

***v.i.*** خوولانەوە بەم جۆرە

**piscary** (pis′kə-ri), ***n.*** (١) مافی ماسی گرتن لە ناوی یەكێكی تردا (٢) شوێنی راوەماسی؛ جێی ماسی گرتن.

**piscatology** (pis′kə-tol′ə-ji), ***n.*** راوەماسی زانی؛ هونەری ماسی گرتن.

**piscatorial** (pis′kə-tôr′i-əl, pis′kə-to′ri-əl), ***adj.*** تایبەتی بە ماسی و ماسیگرو ماسی گرتن

**piscatory** (pis′kə-tôr′i, pis′kə-tō′ri), ***adj.*** piscatorial.

**Pisces** (pis′ēz), ***n.*** (١) كۆئەستێرەی ماسی. (٢) كەلووی ماسی (ئەستێرەناسی)؛ بورجی ماسی. (٣) توخمی ماسی لە بڕبڕەدارەكاندا.

**pisci-** (pis′i), پێشگرێكە بەمانای: ماسی (*pisciculture*) .

**pisciculture** (pis′i-kul′chēr), ***n.*** ماسی پەروەردەكردن (بۆ خۆشی یا فرۆشتن)

**piscina** (pi-sī′nə, pi-sē′nə), ***n.*** جورنەی تەنیشت قوربانیگای كڵێسە.

**piscine** (pis′īn, pis′in), ***adj.*** لە ماسی چوو؛ تایبەتی بە ماسی

**piscivorous** (pi-siv′ēr-əs), ***adj.*** ماسیخۆر

**pish** (pish), ***interj.*** پفیوا؛ دەنگێكە وەڕسی و پەستی و تاقەت چوون دەردەبڕێ.

**pisiform** (pī′sə-fôrm′), ***adj.*** (١) پۆڵكەیی؛ نۆكی؛ لە نۆك دەچێ لە شێوەو قەبارەدا. (٢) تایبەتی بە ئێسقانێكی خڕی مەچەك.

**pismire** (pis′mīr′), ***n.*** مێرووله.

**piss** (pis), ***v.i. & v.t.*** مێزكردن

***n.*** مێز (ووشەیەكی ناشرینە)؛ (*to take a ~*) .

piss off. [Slang]. تووڕەكردن؛ پەستكردن؛ تووڕەبوون؛ پەست بوون؛

(*I was pissed off at him.; She pissed me off.*)

**pistachio** (pis-tä′shi-o′, pis-tash′i-o′), ***n.*** (١) داری بستە (٢) بستە (٣) تامی بستە (٤) سەوزی كاڵ؛ سەوزی زەردباو.

**pistil** (pis′til, pis′t'l), ***n.*** نێرك؛ ئەندامی مێینەی گوڵ

**pistillate** (pis′tə-lit, pis′tə-lāt′), ***adj.*** نێركدار (بەتایبەتی بەبێ بوونی نێرەك).

**pistol** (pis′t'l), ***n.*** دەمانچە.

***v.t.*** دەمانچە پێوەنان؛ دەمانچە تێ تەقاندن.

**pistole** (pis-tōl′), ***n.*** پارەیەكی زێڕی ئیسپانی یا ئەورووپایی كۆنە.

**pistoleer, pistolier** (pis′tə-lēr′), ***n.*** دەمانچەهەڵگر؛ دەمانچە لە قەد.

**piston** (pis′t'n), ***n.*** پستن؛ پەستێنەر؛ لوولەكی ماتۆجۆكەر (مەكینەناسی).

**piston ring,** ئەڵقەی پەستێنەر

**piston rod,** باسكی پەستێنەر

**pit** (pit), ***n.*** ناوك (خورما، هەڵووژە، قۆخ)؛ دەنك

***v.t.*** ناوك لێ دەرهێنان

**pit** (pit), ***n.*** (١) چاڵ؛ چاڵایی؛ قوونكە (٢) چاڵی بێ بن (وەك تۆونی بابا). (٣) دۆزەخ (٤) تەپكە؛ چاڵێكە بۆ بە داوەوەكردنی گیانداری كێوی. (٥) داو؛ تەڵە؛ مەترسی شاراوە (٦) مەیدانی شەڕە كەڵەشێرو شەڕە سەگ (٧) (أ) لوولەی باكێشی كان (ب) كان؛ كانگە. (٨) چاڵایی لەش (وەك بن باڵ)؛ (*an armpit*) (٩) چاڵایی پێست بەهۆی نەخۆشییەوە (وەك كونجیی دەموچاو بەهۆی ئاولەوە). (١٠) (أ) [British] نهۆمی یەكەمی شانۆ بەتایبەتی بەشی دواوەی (ب) ئەوانەی لەم بەشەی دواوە دادەنیشن (١١) چاڵایی بەردەمی شانۆ كە ئۆركێسترای تێدا دادەنیشێ. (١٢) قوژبنێكی تایبەتی بازاری پارەبازی. (١٣) قوژبنی بەنزین تێكردنەوەو تایە گۆڕین لە مەیدانی پێشبڕكێی ئوتومبێلدا

***v.t.*** (١) خستنە چاڵەوە؛ لە چاڵدا هەڵگرتن (٢) چاڵ كردن. (٣) كونج بوون؛ خاڵی ووردوورد تێدا هەڵكەندن (ئاولە)؛

(*~ted by smallpox*)

(٤) دان به شەڕ (سەگ، کەڵەشێر، مرۆڤ، تاقم)؛ دان بەیەکدا؛ بەرامبەر یەکتر وەستاندن: *( to ~ one group against another)*

***v.i.*** چاڵ بوون؛ چاڵایی تێکەوتن؛ چاڵ چاڵ بوون؛ کونج بوون

**pitch** (pich), ***n.*** قیر؛ زفت؛ ئەسفەلت

***v.t.*** قیرتاوکردن؛ بە ئەسفەلت سواغدان یا داپۆشین

**pitch** (pich), ***v.t.*** (١) هەڵدان (چادر) *( to ~ a tent)*.
(٢) فڕێدان؛ هاویشتن؛ هەڵدان (بەرد، تۆپ).
(٣) ئامادەکردن و ڕێکخستن بۆ جەنگ *( ~ed battle)*.
(٤) لە پلەیەک یا ئاستێکدا دانان
(٥) تۆپ هاویشتن بۆ تۆپ لێدەر کە گورزەکەی بەدەستەوەیە (یاری بەیسبۆل)
(٦) دیاریکردنی بەرزیو نزمی ئاوازی مۆسیقا

***v.i.*** (١) هەوار هەڵدان (٢) جێگیربوون. (٣) فڕێدان (تۆپ)؛ هەڵدان
(٤) بە سەردا کەوتنەخوارەوە (٥) بەرەو خوار بوونەوە؛ نووین؛ داکەوتن.
(٦) هەڵبەزودابەزکردن (کەشتی)؛ تاسەکردن. (٧) لەتردان.

***n.*** (١) هەڵدان؛ شێوەی هەڵدان. (٢) فڕێدانێک؛ هاویشتنێک.
(٣) هەڵبەزودابەزی کەشتی؛ تاسە؛ لەتر. (٤) قوژبنی چەرچی.
(٥) پلە *( Excitement was at a high ~.)*
(٦) پلەی لێژی؛ پلەی لێژی سەربان (خانووی ڕۆژاوایی): *( the ~ of a roof)*
(٧) پلەی بەرزونزمی (دەنگ، مۆسیقا، قسە... هتد): *( the ~ of a voice)*.
(٨) [Slang]، وتەو وتارو پڕوپاگەندەیەکە بۆ سازکردن و قایل کردن و پێ سەلماندن وەک چەرچی و فرۆشیاری ترو خاوەن بیروباوەڕێک بەکاری دەهێنن بۆ ڕاکێشانی خەڵک؛ جاڕ

**pitch in,** [Colloq.], (١) دەست بە کارکردن بە چالاکی؛ قۆڵ لێ هەڵکردن و دەست بە ئیشکردن (٢) هەرەوەزی کردن؛ هاوکاری کردن؛ یارمەتیدان: *( We all pitched in and planted a garden.)*

**pitch into,** [Colloq.]. هێرش بردنە سەر (بە دەم یا بە دەست)؛ پەلاماردان

**pitch on ( or upon ),** هەڵبژاردن

**pitch one's tent,** جێنشین بوون؛ جێگیربوون

**pitch-black** (pich′blak′), ***adj.*** ڕەشە وەک خەڵوور؛ زۆر ڕەش؛ ڕەشە وەک قیر.

**pitch-dark** (pich′därk′), ***adj.*** تاریک‌ونووتەک؛ زۆر تاریک؛ شەوەزەنگ

**pitched battle,** (١) شەڕی دەستەویەخەی نێوان دوو لەشکر پاش خۆ بۆ ئامادەکردن و دیاریکردنی شوێنی هەردوو لەشکرەکە.
(٢) شەڕی گەرم؛ ئاکۆکی زۆر خراپ

**pitcher** (pich′ẽr), ***n.*** (١) سوراحی (٢) پڕ سوراحی‌یەک.
(٣) گەڵای وەک سوراحی

**pitcher** (pich′ẽr), ***n.*** (١) تۆپ هاوێژ (یاری بەیسبۆل)
(٢) جۆرە گوڕزێکی گۆڵفە کە سەرەکەی بەدوادا هەنگەڕاوەتەوە.

**pitcher plant,** ڕووەکێکە گەڵاکانی لە سوراحی دەچن جانەوەر ڕادەکێشن و دەیانگرن

**pitchfork** (pich′fôrk′), ***n.*** سێلک (کشتوکاڵ)

***v.t.*** کرشە هەڵگرتن یا گوێزانەوە بە سێلک

**pitchman** (pich′mən), ***n.*** چەرچی؛ دەستگێڕ (بەتایبەتی یەکێک کە قوژبنی جادەیەکی گرتبێ بۆ خۆی و لەبەرەودا بێ)

**pitch pine,** سنەوبەری جەویدار یا ڕێزندار

**pitch-stone** (pich′stōn′), ***n.*** بەردی ئاگرپژێنی ڕەشی بریقەدار

**pitchy** (pich′i), ***adj.*** (١) قیراوی؛ قیرلێدراو (٢) لینج
(٣) ڕەش؛ تاریک

**piteous** (pit′i-əs), ***adj.*** (١) بەسزمان؛ جێی بەزەیی پێداهاتنەوەیە؛ داماو (٢) [Archaic]، بەبەزەیی؛ بەهەست؛ بەڕەحم

**pitfall** (pit′fôl′), ***n.*** (١) داو؛ تەڵە؛ تەپکە؛ چاڵی بە ئاستەم سەرگیراو بۆ گرتنی گیاندار. (٢) مەترسی شاراوە؛ داو.

**pith** (pith), ***n.*** (١) ناوەڕۆک (قەفی ڕووەک)؛ ناوکرۆک؛ کاکڵ. (٢) مۆخ.
(٣) گەوهەر؛ کرۆک؛ پوختە. (٤) هێز؛ توانا.

***v.t.*** (١) ناوەڕۆک لێ دەرهێنان (ڕووەک).
(٢) (ا) بڕبڕاگە یا پشت شکاندن و کوشتن. (ب) بڕبڕاگە سڕکردن بۆ تاقیکردنەوە لە تاقیگەدا.

**Pithcanthropus** (pith′ə-kan′thrə-pəs), ***n.*** ئادەمیزادی جاوە ئادەمیزادی کۆنی قرتێکەوتووە ئێسقانەکانی لە " جاوە " دۆزراوەتەوە.

**pithy** (pith′i), ***adj.*** (١) (ا) ناوکرۆکاوی؛ مۆخاوی. (ب) پڕ لە ناوکرۆک؛ ناودار؛ بوردوو؛ بڵ؛ پڕ مۆخ (٢) کورت و بەمانا؛ پڕ مانا؛ بەهێز؛ زمانپاراو *( a ~ style)*

-pithily *(adv.)*; **pithiness** *(n.)*.

**pitiable** (pit′i-ə-b'l), ***adj.*** (١) بەسزمان؛ شایستەی بەزەیی پێداهاتنەوەیە. (٢) بۆگەن؛ پیس؛ نزم؛ شایستەی بە چاوی سووک سەیرکردنە؛ ناپەسەند.

-pitiably *(adv.)*.

**pitiful** (pit′i-fəl), ***adj.*** (١) بەهەست؛ هاوهەست؛ بەبەزەیی.
(٢) بەسزمان؛ جێی بەزەیی پێداهاتنەوەیە؛ جێی دڵ پێ سووتانە؛ جێی داخە: *( a ~ sight)*.
(٣) شایستەی بە چاوی سووک سەیرکردنە؛ پیس‌وبۆگەن؛ ناپەسەند

-pitifully *(adv.)*; **pitifulness** *(n.)*.

**pitiless** (pit′i-lis), ***adj.*** بێ بەزەیی؛ دڵڕەق؛ بێ ڕەحم.

**pitman** (pit′mən), ***n.*** (١) کرێکاری کانگا.
(٢) باسکی لێدان (مەکینەکاری).

**pitton** (pit′ən), ***n.*** مێخێکی کانزایی‌یە لە هەڵگەڕان بە شاخی بەردیندا بەکاردەهێنرێ.

**pit saw,** مشارێکی گەورەیە بە دوو کەس بەکاردەهێنرێ یەکێکیان لەسەر بڕەدارەکە دەوەستێ و ئەوی تریشیان لە چاڵێکدا.

**pittance** (pit′əns), ***n.*** (١) مووچەی کەم؛ پارەی بۆ بڕاوە (خەرجی کەم)؛ پارەی هیچ‌وپووچ: *( He gets a mere ~.)*.
(٢) هەندێکی کەم (خواردن، ئازووقە)؛ بەشی کەم؛ بڕێکی هیچ‌وپووچ؛ شتێکی زۆر کەم.

**pitted** (pit′id), ***adj.*** (١) چاڵاوی؛ چاڵ چاڵ.
(٢) کونج (وەک دەم‌وچاوی ئاوڵاوی): *( His face was ~ with samll pox.)*

**pitter-patter** (pit′ẽr-pat′ẽr), ***n.*** پرتەپرت (دڵ)؛ تەقەتەق؛ تەپەتەپی ئەسپایی پێ؛ لێدان.

**pituitary** (pi-tōō′ə-ter′i, pi-tū′ə-ter′i), ***adj.*** (١) چڵمی؛ چڵم دەردەر؛ شلەی وەک چڵم دەردەر. (٢) هی لووی ژێر مێشک.
(٣) تایبەتی بە جۆرە لەشێکی ئێسقان زۆر ئەستوورو قۆڵ و لاق زۆر درێژە بەهۆی زۆر دەردانی هۆرمۆنی لووی ژێر مێشکەوە.

**pituitary gland ( or body ),** لووی ژێر مێشک.

**pity** (pit′i), ***n.*** (١) بەزەیی؛ بەزەیی پێداهاتنەوە؛ دڵ پێ سووتان؛ حەیف.
(٢) هۆی بەزەیی پێداهاتنەوە یا دڵ پێ سووتان.

**It's a pity!,** داخی گرانم؛ دەستی شکاوم؛ داخەکەم؛ حەیفە.

out of pity, بەهۆی دڵ پێ سووتانەوە.

take ( or **have** ) **pity on,** دڵ پێ سووتان؛ بەزەیی پێداهاتنەوە *( They took pity on him and set him free.)*

**what a pity!,** جێی داخە؛ حەیفە؛ داخەکەم؛ داخی گرانم.

**pityriasis** (pit′ə-rī′ə-sis), ***n.*** (١) نەخۆشی‌یەکی پێستە دەبێتە هۆی توێک فڕێدان. (٢) نەخۆشی‌یەکی پێستی گیانداری ماڵی‌یە دەبێتە هۆی درووستبوونی پوولەکەی ووشکی وەک گەڕی.

**pivot** (piv′ət), ***n.*** (١) خاڵی ڕاگر؛ ڕاگر؛ خاڵی لەسەر وەستان یا ڕاگرتن و خوولانەوە؛ تەوەر. (٢) کەس یا شتی سەرەکی کە هەمووکەس بەدەوریدا دەسووڕێتەوە؛ کەس یا شتی زۆر گرنگ و بڕیاردەری ئەنجامی کارێک؛

گەوهەر؛ شوێنی بەیەکگەیشتن (٣) خوولانەوە لەسەر خاڵی ڕاگر یا بەدەوری تەوەرێکدا

***adj.*** سەرەکی؛ بنچینەیی؛ گرنگ؛ تەوەری.

***v.t.*** ڕاگرتن لەسەر خاڵی ڕاگر یا خوولانەوە بەدەوری تەوەرێکدا.

***v.i.*** خوولانەوە لەسەر خاڵی ڕاگر؛ خوولانەوە بەدەوری تەوەرێکدا.

**pivotal** (piv′ət-'l), ***adj.*** (١) هی ڕاگر؛ هی خاڵی ڕاگر؛ تەوەری.
(٢) سەرەکی؛ زۆر گرنگ؛ ناوجەرگەیی: ***( a ~ event, act, man, etc.)*** .

**pixy** (pik′si), ***n. Also*** **pixie,** جنۆکە؛ دێوودرنج؛ پەری.

**pizza** (pēt′sə), ***n.*** پیتزە خواردەمەنییەکی ئیتاڵییە بریتییە لە لەواشەیەك کە پەنیرو دۆشاوی تەماتەو بەهارات و گۆشتی قیمەکراو یا شتی وەك قارچك و زەیتوون و بیبەری بەسەرەوە دەکرێ و لە فڕندا دەبرژێنرێ.

**pizzeria** (pēt′sə-rē′ə), ***n.*** چێشتخانەی پیتزە؛ پیتزەخانە.
(ووشەی پێشوو ببینە).

**pizzicato** (pit′sə-kä′tō), ***adj., adv. & n.,*** بە سەری پەنجە لێدراو (ئامێری مۆسیقایی ژێدار وەك عوود و گیتار).

**pizzle** (piz′'l), ***n.*** کێری گیاندار (بەتایبەتی کەڵەگا).

**placable** (plā′kə-b'l, plak′ə-b'l), ***adj.*** دڵی نەرم دەبێ؛ بەخشندە؛ لێبووردە.

**-placability** ***(n.)***; **placably** ***(adv.).***

**placard** (plak′ärd), ***n.*** بلاونامە (کە بە شوێنێکی گشتیدا هەڵواسرێ)؛ یافتە؛ ئاگاداری هەڵواسراو.

***v.t.*** (١) بلاونامە هەڵواسین (بە دیواردا).
(٢) بلاوکردنەوە لەڕێی یافتە یا بلاونامەوە.

**placate** (plā′kāt, plak′āt), ***v.t.*** دڵ نەرم کردن؛ هێمن کردنەوە؛ دڵنەوایی کردن؛ ڕازی کردن.

**-placation** ***(n.)***; **placative** ***(adj.)***; **placator** ***(n.).***

**place** (plās), ***n.*** (١) مەیدان (ناوشار). (٢) شەقامێکی کورت و بارێك.
(٣) شوێن؛ جێگە؛ جێگەبوونەوە؛ شوێن هەبوون.
(٤) ناوچە؛ هەرێم؛ شوێن.
(٥) (ا) شوێنی کەسێك. (ب) باری ژیانی کەسێك.
(٦) شار؛ شارۆچکە؛ دێ.
(٧) ماڵ؛ خانە؛ خانوو.
(٨) شوێن یا خانووی تەرخانکراو بۆ شتێکی تایبەتی:
***( a ~ of amusement)***
(٩) خاڵ یا برینی سەر شوێنێك یا ڕوویەك.
(١٠) شوێنێکی تایبەتی لە گۆڤارو پەرتووکێکدا (لاپەڕە، بەند).
(١١) پێەوپایە؛ جێگە؛ پایە: ***( His ~ in history is assured.)*** .
(١٢) خاڵ؛ پلە؛ هەنگاو ***( in the first ~ )*** .
(١٣) جێی خۆی؛ جێ و کاتی شیاو یا بەجێ:
***( There's a time and a ~ for everything.)***
(١٤) جێ؛ باری ژیان: ***( If I were in your ~ )*** .
(١٥) جێ؛ جێگری؛ لەباتی: ***( He acted in ~ of his brother.)*** .
(١٦) پێەوپایە؛ کاربەدەستی؛ فەرمانبەری
(١٧) ئەرکی سەرشان؛ ئیش وکار؛ ئیش.
***( It is not my ~ to tell him that.)***
(١٨) جێگەی دانیشتنی کەسێك لەسەر مێز، کورسی... هتد.
(١٩) (ا) پلە (پێشبڕکێ)؛ ئەوەندەیەمین کەس لە بۆڕبۆڕێنێکدا:
***( He came in second ~ .)***
(ب) پلەی دووەمین (بۆڕبۆڕێن).

***v.t.*** (١) دانان لە شوێنێکدا؛ خستنە شوێنێکەوە.
(٢) دانان لەسەر ئیش؛ دامەزراندن؛ ئیش بۆ دۆزینەوە
(٣) داوای شت کڕین کردن لە کۆمپانیای سەرچاوە؛ ناردنی ئەم داواکارییە:
***( The bookstore ~d an order for the new books.)***
(٤) ناسینەوە ***( I know his face but I can't ~ him.)*** .
(٥) خستنەسەر لۆمە؛ دیاریکردن و لۆمەکردن ***( to ~ blame)*** .

(٦) پشت پێ بەستن؛ ئومێد پێ بوون؛ بڕوا پێ بوون:
***( to ~ confidence in someone)***

***v.i.*** بردنەوە بە یەکەم، دووەم، یا سێهەم (بەتایبەتی بە دووەم لە غارغارێنی ئەسپ و ڕاکردنی سەگدا) ***( His horse ~d.)*** .

**give place,** (١) جێکردنەوە؛ شوێن بۆ کردنەوە.
(٢) ڕێگەدان؛ جێگە بۆ چۆڵ کردن.

**go places, [Slang],** سەرکەوتن؛ سەرکەوتوو بوون.

**in place,** (١) لە جێی خۆیایەتی؛ لە شوێنی خۆیدا دانراوە.
(٢) شیاو؛ بەجێ؛ گونجاو؛ پەسەند.

**in the first place,** لەپێش هەمووشتێکدا؛ یەکەم.

**know one's place,** خۆ لێ نەگۆڕان؛ بەپێی بەرەی خۆ پێ ڕاکێشان؛ لە سنووری خۆ تێ نەپەڕین (بەتایبەتی کەسێکی ژێردەستە).

**out of place,** (١) لە جێی خۆیدا نییە. (٢) نابەجێ؛ نەشیاو؛ نەگونجاو.

**put one in one's place,** لووت شکاندن؛ لە لووت دان؛ شکاندنی کەسێکی خۆ لێ گۆڕاو.

**take place,** ڕوودان؛ قەومان؛ هاتنەڕوو.

**take the place of,** جێگرتنەوە (کەس، شت، ڕوودان).

**placebo** (plə-sē′bō), ***n.*** (١) نوێژونزای ئێوارە بۆ گیانی مردوو.
(٢) دەرمانی دڵخۆشکەرە؛ دەرمانە درۆزنە: دەرمانێکە کە هەر بەناو دەرمانە دەدرێت بە نەخۆش بۆ دڵنەوایی کردنی. (٣) دڵخۆشکەرە؛ هێمن کەرەوە؛ شتێك کە دڵنەوایی پێ دەکرێ.

**place-kick** (plās′kik′), ***n., v.t. & v.i.*** شەق تێهەڵدانی تۆپی فوتبۆڵی ئەمەریکی پاش دانانی لەسەر زەوی.

**placeman** (plās′mən), ***n.*** [Chiefly British], فەرمانبەری میری (لەڕووی سووکییەوە).

**place mat,** پارچە تەنراوێکی قوماش یا پووشە دەخرێتە ژێر قاپی نانخواردنی هەموو کەسێکەوە لەسەر مێزی نانخواردن.

**placement** (plās′mənt), ***n.*** (١) دانان؛ دانران.
(٢) ڕێکخستن؛ ڕێکخران. (٣) ئیش بۆ خەڵك دۆزینەوە (لەلایەن فەرمانگەی تایبەتییەوە)؛ دامەزراندن: ***( a ~ office)*** .
(٤) قوتابی دانان لە پۆلی گونجاو لەگەڵ پلەی خوێندن و توانایاندا.
(٥) (ا) دانانی تۆپی فوتبۆڵی ئەمەریکی لەسەر زەوی بۆ شەق تێهەڵدانی (ب) ئەم شەق تێهەڵدانە.

**placenta** (plə-sen′tə), ***n.*** (١) پەردەی منداڵ؛ وێلاش؛ پەردەی ناولەمە.
(٢) جێی پێوەنووسانی گەرا بە نێرکەوە (ڕووەکناسی).

**-placental** ***(adj.).***

**placentation** (plas′'n-tā′shən), ***n.*** (١) (ا) پێکهاتنی پەردەی منداڵ. (ب) شێوەی نووسانی پەردەی منداڵ بە منداڵدانەوە.
(٢) شێوەی نووسانی گەرا بە نێرکەوە (ڕووەکناسی).

**placer** (plas′ēr), ***n.*** (١) خلتەی لم یا زیخە کە زێڕو بەردی بەنرخی تری تێدایە. (٢) جێی شتنەوەی ئەم خلتەیە بۆ لێ دەرهێنانی زێڕەکەی

**placid** (plas′id), ***adj.*** (١) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ بێ دەنگ؛ پڕ ئاسوودە: ***( a ~ lake; a ~ disposition)*** . (٢) پاڵ لێدەرەوە؛ بێباك؛ ڕەحەت؛ لەخۆڕازی؛ هیچ کارتێنەکردوو.

**-placidness** ***(n.)***; **placidly** ***(adv.).***

**placidity** (plə-sid′ə-ti), ***n.*** (١) هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ بێ دەنگی؛ پڕ ئاسوودەیی (٢) پشت لێکردنەوە؛ بێباکی؛ ڕەحەتی؛ لەخۆڕازێتی.

**placket** (plak′it), ***n.*** (١) تلیشی تەنوورەو کراس (بۆ لەبەرکردنی بەئاسانی). (٢) گیرفانی تەنوورە. (٣) [Archaic]، (ا) ژێرکراس (ب) ئافرەت

**plagiarism** (plā′jə-riz′m, plā′ji-ə-riz′m), ***n.*** (١) دزینی نووسین و بیروباوەڕی نووسەر یا دانەرێکی ترو بلاوکردنەوەی بە ناوی خۆوە
(٢) نووسین و بیروباوەڕی دزراو بەم شێوەیە.

**plagiarist** (plā′jə-rist, plā′ji-ə-rist), ***n. Also*** **plagiarizer,** دزی نووسین و بیروباوەڕی نووسەرێکی ترو کردوو بە هی خۆ

**-plagiaristic** ***(adj.).***

**plagiarize** (plā′jə-rīz′, plā′ji-ə-rīz′), *v.t.* دزینی نووسین و بیروباوەری نووسەر یا دانەرێکی ترو بڵاوکردنەوەی بە ناوی خۆوە.
**-plagiarizer** *(n.).*
**plagiary** (plā′jə-ri, plā′ji-ə-ri), *n.* [Archaic], - **1. plagiarism. 2. plagiarist.**
**plague** (plāg), *n.* (١) کارەسات؛ لێقەومان؛ بەڵا. (٢) سزای خودایی. (٣) تاعوون؛ تاعوونە ڕەشە؛ دەرد. (٤) [Colloq.]، شتی ناخۆش و پەستکەر.
*v.t.* (١) تاعوون لێدان؛ تاعوونە ڕەشە تووش بوون؛ دەردلێدان. (٢) پەستکردن؛ هەراسان کردن؛ ئازاردان؛ تووشی ناخۆشی کردن.
**plaguy** (plā′gi), *adj. Also* **plaguey**, [Colloq.], پیس و ناخۆش؛ پەستکەر؛ بێزارکەر.
**plaid** (plad), *n.* قوماشی خانەخانە؛ قوماشێکە نەخشەی میلی لەیەکدراو یا خانەخانەی تێدایە.
*adj.* نەخشەی خانەخانەدار؛ خانەخانە (قوماش).
**plain** (plān), *adj.* (١) تەخت؛ ڕێك؛ تەختایی.
(٢) بەربەرەڵا؛ بەرنەگیراو؛ کراوە: *( a ~ view)* .
(٣) ڕوون؛ تێگەیشتنی ئاسانە؛ ئاسان؛ سادە: *( a ~ prose style)* .
(٤) ڕاستوڕەوان؛ بێ پێچوپەنا؛ لەڕوو: *( ~ talk)* .
(٥) سادە؛ ساکار؛ ئاسایی: *( a ~ meal)* .
(٦) نەختێك ناشرین؛ جوان نییە؛ سادە؛ ئاسایی: *( a ~ face)* .
(٧) سادە؛ ئاسایی؛ خاکی؛ بەبێ کەش وفش: *( a ~ man)*
*n.* دەشت؛ دەشتایی؛ تەخت؛ تەختایی.
*adv.* بەڕوونی
**-plainly** *(adv.)*; **plainness** *(n.).*
**plain-clothes man,** پۆلیسی نهێنی.
**plain dealing,** سەرڕاستی و پاکی (لەگەڵ خەڵکدا).
**plain sailing,** (١) بەلەم و کەشتی ڕاندنی ئاسان.
(٢) کەندوکۆسپ لە ڕێگەدا نەبوون؛ تووشی تەنگوچەڵەمە نەهاتن.
**plainsman** (plānz′mən), *n.* دەشتنشین؛ دانیشتووی دەشتایی.
**plaint** (plānt), *n.* (١) [Poetic]، شیوەن؛ شین؛ کڕووزانەوە.
(٢) سکاڵا
**plaintiff** (plān′tif), *n.* داواچی؛ دادخواز (دادگا)؛ شکاتکەر.
**plaintive** (plān′tiv), *adj.* غەمگین؛ دڵگیر؛ بەسۆز؛ خەفەتاوی:
*( ~ music; a ~ song)*
**plait** (plāt), *n.* (١) توێ یا قەدی قوماش و جلی قەدکراو؛ چرچ
(٢) پرچی هۆنراوە؛ پرچی کلافەکراو
*v.t.* (١) قەدکردن (قوماش، جل). (٢) پرچ هۆنینەوە؛ هۆنینەوە؛ پرچ کلافەکردن.
**plan** (plan), *n.* (١) نەخشە. (٢) نەخشەی خانوو یا زەوی؛ نەخشەی ئەندازەیی؛ ڕەنگ ڕشتن. (٣) نەخشەی کار؛ بەرنامەی کار؛ بەرنامە؛ پلان.
*v.t.* (١) نەخشەکێشان (خانوو، شار، زەمین)؛ ڕەنگ ڕشتن
(٢) نەخشەدانان؛ پلان دانان؛ بەرنامەدانان. (٣) نیازبوون.
*v.i.* نەخشەدانان
**plane** (plān), *n.* سوورەچنار؛ درەختێکە لە سوورەچنار دەچێ
**plane** (plān), *adj.* تەخت؛ ڕێك؛ ڕاست
*n.* (١) ڕووتەخت. (٢) تەختایی؛ ڕێکی.
(٣) پلە؛ ئاست *( a low ~ of culture)* . (٤) فڕۆکە. (٥) باڵی فڕۆکە
**plane** (plān), *n.* ڕەندە (دارتاشی)؛ ڕەنە.
*v.t.* سافولووس کردن بە ڕەندە؛ ڕەنە بەکارهێنان؛ ڕەندەلێدان.
*v.i.* ڕەندە بەکارهێنان
**plane** (plān), *v.i.* (١) فڕین؛ خلیسکان یا خشان بە هەوادا
(٢) بەئاستەم فڕین یا بەرزبوونەوە فڕۆکەی ئاوی:
**plane angle,** گۆشەی ڕاست
**plane geometry,** ئەندازەی ڕووتەخت
**planer** (plān′ēr), *n.* (١) ڕەندە بەکارهێنەر
(٢) ڕەندە بۆ تەختەو کانزا. (٣) پارچەیەك تەختەی سافولووسە تیپی چاپی پێ ڕێك دەکرێ.
**planer tree,** درەختێکی زەلکاوی بچووکە گەڵای هێلکەیی و بەری زبرو گوێز ئاسایی دەگرێ.
**planet** (plan′it), *n.* ئەستێرەی گەڕۆك؛ هەسارە.
**plane table,** مێزی ڕووپێوەری زەوی.
**planetarium** (plan′ə-târ′i-əm), *n.* (١) نموونەی کۆمەڵەی خۆر. (٢) ئامێری پیشاندانی شوێنی خۆرو مانگ و ئەستێرەو ئەستێرە گەڕۆکەکان و خولانەوەی ئەستێرەکان لەناو گوومەزێکدا. (٣) پیشانگایەکی وەها
**planetary** (plan′ə-ter′i), *adj.* (١) ئەستێرەیی؛ تایبەتی بە ئەستێرەی گەڕۆك.
(٢) (ا) زەمینی؛ تایبەتی بەم زەمینە. (ب) جیهانی: *( ~ life)* .
(٣) تایبەتی بە ڕەوڕەوە یا گێڕی دانداری بەدەوری پێچکەی تردا خولاوە.
**planetesimal** (plan′ə-tes′i-m′l), *adj.* ئەستێرەی گەڕۆکی زۆر بچووك.
**planetoid** (plan′ə-toid′), *n.* (١) ئەستێرەی گەڕۆکی زۆر بچووك.
(٢) ئەستێرەی دەستکرد؛ تەنی ئەستێرەیی.
**plane tree, = plane.**
**planet-stricken** (plan′it-strik′n), *adj.* (١) ئەستێرە کار- تێکردوو (ئەستێرەوانی). (٢) تۆقیو؛ زۆر ترساو.
**planet wheel,** ڕەوڕەوەیەکی داندارە کە بەدەوری ڕەوڕەوەیەکی دانداری تردا دەخوولێتەوە.
**plangent** (plan′jənt), *adj.* (١) هاژەی دێت (وەك دەنگی شەپۆلی دەریا)؛ بە دەنگێکی زل پیادران. (٢) (ا) بەرزو دەنگدەرەوە (وەك دەنگی زەنگ) (ب) غەمبار؛ دڵگیر: *( the ~ sound of a guitar)* .
**plani-** (plā′ni, plan′i), پێشگرێکە بەمانای: تەخت؛ ڕێك:
*( planimeter)*
**planimeter** (plə-nim′ə-tēr), *n.* ڕووپێوەر؛ ئامێری پێوانی ڕووبەری ڕووتەخت.
**planimetry** (plə-nim′ə-tri), *n.* ڕووپێوان؛ پێوانی ڕووبەری ڕووتەخت.
**planish** (plan′ish), *v.t.* ئاسن و کانزای تر بە چەکوش کوتان و ڕێكوپێك و ساف کردن.
**planisphere** (plan′ə-sfêr′), *n.* (١) نەخشەی تەنێکی خڕ یا نیوەی لەسەر ڕوویەکی تەخت. (٢) نەخشەی ئەستێرەیەك یا نیوەی.
**plank** (plaŋk), *n.* (١) تەختەدارێکی ئەستوورو درێژ (وەك هی ژێر هێڵی شەمەندەفەر). (٢) بناغە؛ بنچینە.
(٣) یەکێك لە بەندەکانی حیزبێك، کۆمەڵەیەك، یا بەرنامەیەکی ڕامیاری
*v.t.* (١) بە تەختەدار داپۆشین؛ تەختەدار دانان؛ زەوی داپۆشین بە تەختەدار
(٢) برژاندن و پێشکەشکردن لەسەر تەبەق (ماسی، گۆشت).
(٣) [Colloq.]، فڕێدانە سەر زەوی.
(٤) [Colloq.]، ( **~ down; ~ out** )، جرنگاندن؛ پارەدان (بە فڕێدانی)
**walk the plank,** بە چاوبەستراوەیی ڕۆیشتن بەسەر دەستەکی درێژبووەوە لە کەشتییەوە (وەك چەتەی دەریایی لەو کەسانەیان دەکرد کە دەیانگرتن).
**planking** (plaŋk′iŋ), *n.* (١) زەوی داپۆشین بە تەختەدار؛ تەختەدار دانان؛ داپۆشین بە تەختەدار. (٢) تەختەدار؛ سەرجەمی تەختەدار
(٣) تەختەداری خانوویەك یا چوارچێوەیەك.
**plank sheer,** تەختەداری دەوری پشتی کەشتی.
**plankton** (plaŋk′tən), *n.* ڕووەك و گیانداری گەردبینیی ناو ئاوو سەرئاوکەوتوو.
**planner** (plan′ēr), *n.* نەخشەکێش؛ بەرنامەدانەر؛ نەخشەدانەر.
**plano-** (plan′ō, plan′ə), *Also* **plan-,** پێشگرێکە بەمانای: گەڕۆك
**plano-** (plā′nō), *Also* **plani-,** پێشگرێکە بەمانای: تەخت؛ ڕێك:
*( planoconcave)*
**planoconcave** (plā′nō-kon′kāv), *adj.* دیوێکی تەختەو

دیوێکی قوپاو

**planoconvex** (plā′nō-kon′veks), *adj.* دیوێکی تەختەو دیوێکی قۆقز.

**planometer** (plə-nom′ə-tēr), *n.* پێوەری تەختی یا ڕێکی ڕوو.

**plant** (plant, plänt), *n.* (١) نەمام؛ شەتڵ
(٢) سەوزایی؛ شینایی؛ دارودرەخت. (٣) ڕووەك؛ ڕووەکی قەف یا لاسك نەرم.
(٤) (أ) کارخانە؛ کارگە. (ب) کەرەسەو خانوو مەکینەکانی کارگە.
(٥) کەرەسەو خانووی دەستگایەك. (٦) مەکینەو ئامێری کارێك.
(٧) [Slang]، فێڵوتەڵەکە؛ پیلان؛ داو؛ تەڵە.
(٨) [Slang]، کەسێك یا شتێکی بە داوەوەکەر.
*v.t.* (١) ڕواندن؛ ناشتن؛ چاندن. (٢) چەسپاندن؛ تێدا دانان؛ تێدا چەسپاندن.
(٣) خستنە مێشکەوە؛ لە مێشکدا چەسپاندن:
*( to ~ the seed of doubt in someon's mind)*
(٤) دامەزراندن؛ دانان لە شوێنێکدا (ئاین).
(٥) دانان (ئاوایی)؛ دامەزراندن؛ ئاوادانکردنەوە.
(٦) بەچکە ماسی خستنە ناو ئاوەوە لە شوێنێکی تر بۆ گەورەبوون و زاوزێ.
(٧) تێدا ناشتن؛ تێدا ڕواندن؛ تێدا چاندن.
(٨) [Slang]. مستەکۆڵەلێدان لە شوێنی خۆیدا.
(٩) [Slang]، داو نانەوە؛ تەڵە بۆ دانان.
(١٠) [Slang]. شاردنەوەی شتی دزراو.

**plantain** (plan′tin), *n.* ڕووەکێکە گەڵاکەی لە نزیك بنی لاسکەکەیەوە گوڵی جوان بە لاسکی درێژی نووك تیژەوە دەگرێ؛ گوێ کارژۆڵ.

**plantain** (plan′tin), *n.* (١) جۆرێکە لە دارمۆز.
(٢) مۆزی ئەم جۆرە درەختە.

**plantar** (plan′tēr), *adj.* بن پێیی؛ تایبەتی بە بنی پێ.

**plantation** (plan-tā′shən), *n.* (١) ئاوایی تازە؛ ناوچەیەکی تازە ئاوەدانکراوە (٢) کێڵگە؛ زەوی چێنراو یا نێژراو.
(٣) کێڵگەیەکی گەورەیە ئەو وەرزێرانەی ئیشی تێدا دەکەن تیایشیدا دەژین:
*( a sugar ~ ; a cotton ~ )*
*( a rubber ~ )* (٤) زەوی وەرارێکی گەورەی بە درەخت نێژراو:

**planter** (plan′tēr, plän′tēr), *n.* (١) خاوەن کێڵگە؛ خاوەن کشتکەی گەورە (٢) چێنەر (مرۆڤ، مەکینە)؛ ڕوێنەر؛ نێژەر؛ کشتکار؛ کشتیار.
(٣) ئینجانە (گەورە یا بچووك گڵێن یا دارین بۆ گوڵ و ڕووەکی بۆنخۆش).
(٤) ئاواکەرەوە (هی ناوچەی دوورو چۆڵەوانی)

**plantigrade** (plan′tə-grād′), *adj.* تایبەتی بە گیاندارێك کە لەسەر هەموو بنی پێی دەڕوات (مرۆڤ، وورچ).
*n.* گیاندارێکی وەها

**plant louse,** سن؛ ئەسپێی ڕووەك؛ ئەسپێی گەنم.

**plaque** (plak), *n.* (١) (أ) تەختەدار یا تەختەبەردی نەخشاوی ڕازێنەرەوە (ب) تەختەدار یا تەختەبەردێکە دەنرێت بە شوێنێکەوەو مێژووی ئەو شوێنە یا شتەی لەسەر دەنووسرێتەوە؛ تەختەدار یا تەختەبەردی یادداشت.
(٢) پەخە؛ نەخەبەند یا دروشمی ئەندامێتی (٣) بەڵغی ڕەق و بەردینی سەرو ژێرو ئەبنی ددان (ددانسازی)

**plash** (plash), *n.* چاڵاو

**plash** (plash), *v.t. & v.i.* = splash.

**-plasia** (plā′zhə, plā′zhi-ə), پاشگرێکە بەمانای گەورەبوون؛ گۆڕین؛ گەشەکردن

**plasm** (plaz′m), *n.* = plasma.

**-plasm** (plaz′m), پاشگرێکە بەمانای: پرۆتۆپلازم؛ ماددەی پێکهێنەری خانەی زیندەوەر؛ ماددەی شلی خانەی ڕووەك و گیاندار.

**plasma** (plaz′mə), *n.* (١) جۆرە بەردێکی بەنرخ "کوارتز"ی سەوزی نیمچە ڕوونە. (٢) زەرداوی خوێن؛ پلازمای خوێن؛ بەشی ئاوی خوێن و ماست.
(٣) پرۆتۆپلازم (٤) جۆرە گازێکە ژمارەی ئایۆن و ئەلەکترۆنەکانی ئەوەندەی یەکترن (فیزیا)

**plasmo-** (plaz′mō, plaz′mə), = **plasma.**

**plasmolysis** (plaz-mol′ə-sis), *n.* چوونەوەیەکی پرۆتۆپلازمی خانەی زیندەوەر (لە ئەنجامی ئاو کەم بوونەوەیەدا).

**plasmolyze** (plaz′mə-līz′), *v.t.* هێنانەوەیەکی پرۆتۆپلازمی خانەی زیندەوەر.

**-plast** (plast), پاشگرێکە بەمانای: خانە؛ شانە.

**plaster** (plas′tēr, pläs′tēr), *n.* (١) گەچ؛ هێلم.
(٢) مشەمای لە پشت کرتن بۆ نەهێشتنی ئێش و ئازار.
*v.t.* (١) سواغدان (بە گەچ یا شتی تر)؛ گەچکاری کردن؛ ڕووکەش کردن.
(٢) پێوەنووساندن؛ لێدان.

**plasterboard** (plas′tēr-bôrd′, pläs′tēr-bōrd′), *n.* تەبەقی-گەچین: تەبەقی گەورەی گەچە هەردوو دیوی بە کاغەزی ئەستوور گیراوە لە دیوی ناوەوەی دیوار دەدرێ (خانووکاری).

**plaster cast,** (١) قاڵبی گەچ (بۆ پەیکەر دروستکردن).
(٢) ئێسکبەندی گەچ (بۆ گرتنەوەی ئێسقانی شکاو و لەجێچوو).

**plastered** (plas′tērd, pläs′tērd), *adj.* سەرخۆش؛ سەرمەست.

**plastering** (plas′tēr-iŋ, pläs′tēr-iŋ), *n.* (١) گەچکاری؛ سواغدان. (٢) سواغ؛ چینێك سواغی گەچ.

**plaster of Paris,** گەچی پاریس: جۆرە گەچێکە ئێسکبەندو قاڵبی پەیکەری لێ دروست دەکرێ

**plastic** (plas′tik), *adj.* (١) نەرم؛ شلك؛ بەئاسانی دەنووشتێتەوە؛ پلاستیکی. (٢) تایبەتی بە دروستکردن؛ دروستکاری: *( the ~ arts)*
(٣) پێکهێنەر. (٤) زوو کاری تێ دەکرێ؛ بەئاسانی کاری تێ دەکرێ.
(٥) ڕێك و پێك و جوان؛ پەیکەری؛ جوان دروستکراو
(٦) پلاستیکی؛ لە پلاستیك دروستکراو.
(٧) ڕیشاڵ پێکهێنەر (زیندەوەرناسی)
*n.* (١) پلاستیك؛ باغە. (٢) شتێکی پلاستیکی.

**plastic arts,** هونەری قاڵبکاری (وەك پەیکەرتاشی و گڵینەکاری).

**plasticity** (plas-tis′ə-ti), *n.* نەرمی؛ شلکی؛ بەئاسانی نوشتانەوە.

**plasticize** (plas′tə-sīz′), *v.t. & v.i.* وەك پلاستیك لێکردن؛ نەرم کردن؛ والێکردن یا لێهاتن کە بەئاسانی بنووشتێتەوە.

**plasticizer** (plas′tə-sīz′ēr), *n.* ماددەیەکە دەکرێتە پلاستیکەوە بۆ ئەوەی نەرمتر بێ و بەئاسانی بنووشتێنرێتەوە

**plastic surgeon,** نەشتەرگەری جوانکردن (ووشەی داهاتوو ببینە).

**plastic surgery,** نەشتەرگەری جوانکردن: نەشتەرگەری ڕاستکردنەوەو چاکردنەوەی ئەندام و ڕیشاڵی ناتەواو و کەموکووڕیدارو سووتاوی لەش

**plastron** (plas′trən), *n.* (١) قەڵغان؛ زرێ
(٢) بەرۆکێکی قایشی پارێزەرە شیرباز لەبەری دەکات
(٣) نەخشی ڕازێنەرەوەی بەرۆکی کراسی ئافرەت. (٤) بەرۆکی کراسی پیاو
(٥) قاوغی ژێر سکی کیسەڵ و کیسەڵی ئاوی.

**-plasty** (plas′ti), پاشگرێکە بەمانای: (أ) پێکهاتن؛ گەشەکردن؛ گەورەبوون. (ب) تایبەتی بە نەشتەرگەری جوانکردن.

**plat** (plat), *v.t.* هۆنینەوە؛ کلافەکردن؛ تەنین

*n.* [Dial.]. پرچی هۆنراوە

**plat** (plat), *n.* (١) پارچە زەوییەکی بچووك؛ پارچەیەك زەوی (بەتایبەتی کە خانووی لەسەر دروست کرابێ یا بکرێ) (٢) نەخشەی پارچە زەوی (خانووی لەسەر بێ یا نا)
*v.t.* نەخشەکێشان (پارچە زەوی)

**plate** (plāt), *n.* (١) پەرەك؛ تەبەق. (٢) پەڕەی کانزا؛ تەبەقە کانزا.
(٣) پارچە قەڵغان. (٤) قەڵغان؛ زرێ (٥) تەبەقە کانزای شت لەسەر هەڵکەنراو
(٦) قاڵب یا وێنەی تەبەقە کانزایەکی شت لەسەر هەڵکەنراو.
(٧) وێنەی ناو پەرتووك (کە لاپەڕەیەکی تەواو بگرێتەوە).
(٨) قاپ و کەوچك و چەتاڵی زێڕو زیو
(٩) قاپ و کەوچك و چەتاڵی ڕووکەشکراو بە زێڕو زیو. (١٠) قاپ؛ دەوری
(١١) قاپێك خواردەمەنی؛ پڕ قاپێك چێشت (١٢) خواردەمەنی ناو قاپ.

(١٣) ژەم: *( They serve dinner at six dollars a ~ .)* .
(١٤) دەفری پیتاك كۆكردنەوەی كلێسە. (١٥) توێی گۆشتی گا.
(١٦) پوولەكەی ماسی؛ پەڕەكی ئێسقان. (١٧) نیرگە.
(١٨) سەرشار (یاری بیسبۆل). (١٩) تاقمە ددان.
(٢٠) ئەنۆد: جەمسەری گەرمی باتری و رادیۆ... هتد.
(٢١) تەبەقە شووشەی ڕووكەشكراو بە ماددەیەك كە ڕووناكی زۆر كاری تێ دەكات (وێنەگری). (٢٢) كلێشە (چاپەمەنی).
(٢٣) (أ) خەڵات (بەتایبەتی كاسەی زێڕ یا زیو كە دەكرێتە خەڵاتی براوەی پێشبڕكێیەك)؛ كاسەی قارەمانێتی. (ب) پێشبڕكێ (بەتایبەتی غارغارێن).
*v.t.* (١) زەركفتكردن؛ زیوتێگرتن؛ ڕووكەش كردن (بە زێڕ، زیو... هتد).
(٢) تەبەقە كانزا تێگرتن بۆ پاراستن؛ بە پەڕەكی ئاسن داگرتنەوە بۆ قایمی و پارێزگاری كردن. (٣) كلێشە داڕشتن (چاپەمەنی).
(٤) ساف و لووس و بریقەداركردنی پەڕەی كاغەز.

**plateau** (pla-tō′), *n.* (١) دەشتی بەرز و فراوان؛ دەشتایی تەختێك بەرز.
(٢) قۆناغ یا باری وەك خۆمانەوە؛ سەردەم یا باری هێمن و بە ئاسوودەو كەم بازاڕی و كەم گۆڕان و شت كەم تیادا ڕوودان.

**plated** (plāt′id), *adj.* (١) زرێ پۆش؛ پەڕەكی كانزا لێدراو؛ زرێدار.
(٢) دووڕوو (جل و بەرگ) (٣) ڕووكەشكراو بە زێڕ و زیو... هتد؛ زەركەش؛ زەركفت *( silver- ~ ; gold- ~ )* .

**plateful** (plāt′fool′), *n.* پڕ قاپێك؛ قاپێك *( a ~ of rice)* .

**plate glass,** شووشەی ئەستووری ئاوێنە و پەنجەرەی گەورە.

**platelet** (plāt′lit), *n.* خڕۆكەیەكی ناو خوێنی بڕبڕەدارەكانە لە خڕۆكەی سوور بچووكترە و یارمەتی خوێن مەیین دەدات.

**platen** (plat′'n), *n.* (١) گیرەی كاغەزی مەكینەی چاپ: كە بریتییە لە تەبەلێك یا لوولەیەك كە كاغەزەكە ڕادەگرێ لەبەردەمی تیپەكاندا.
(٢) لوولەكر ئامێری پێنووس.

**plater** (plāt′ẽr), *n.* (١) بكەری plate . (٢) ئەسپی غارغارێنی كەنگ.

**platform** (plat′fôrm′), *n.* (١) سەكۆ؛ هەیوان.
(٢) دووانگە؛ شانۆ (بۆ دووان یا ووتار خوێندنەوە).
(٣) شۆستەی وێستگەی شەمەندەفەر.
(٤) بەرنامە؛ بەرنامەی حیزبێك یا كۆمەڵەیەك:
*( The party ~ was adopted.)*

**platform car,** فارگۆنی سەرو لا بەرەڵای شەمەندەفەری بار. (پێشی دەووترێ: " **flatcar** ").

**platina** (plat′'n-ə, plə-tē′nə), *n.* [Obs. or Rare], = **platinum.**

**plating** (plāt′iŋ), *n.* (١) ڕووكەش كردن بە كانزا؛ كانزالێدان؛ زەركفت كردن. (٢) چینێك پەڕەكی كانزایی؛ چینێك تەبەقی كانزایی.
(٣) زەركەش؛ ڕووكەشی تەنكی زێڕ یا زیو؛ زەركفت.

**platinic** (plə-tin′ik), *adj.* پلاتینی؛ تایبەتی بە پلاتین؛ پلاتینی تێدایە

**platinize** (plat′'n-īz′), *v.t.* پلاتین لێدان؛ ڕووكەش كردن بە پلاتین.

**platino-, platin-, platini-,** پێشگرێكە بەمانای: پلاتین.

**platinoid** (plat′'n-oid′), *adj.* لە پلاتین دەچێ؛ پلاتینی شێوە.
*n.* (١) داڕشتەیەكە لە مس و چینكۆ و نیكڵ و تەنگستۆن پێكدێت (تەلی كارەبای لێ درووست دەكرێ). (٢) كانزایەكە لە توخمی پلاتین.

**platinous** (plat′'n-əs), *adj.* پلاتینی؛ پلاتینی تێدایە؛ لە پلاتین دەچێ.

**platinum** (plat′'n-əm), *n.* (١) پلاتین: كانزایەكی سپی زیویی بەنرخە. (٢) خۆڵەمێشی؛ بۆر.

**platinum black,** تۆزی پلاتینی.

**platinum blonde,** (١) ڕەنگی زەردی پلاتینی یا زیوی (بەتایبەتی هی قژ) (٢) ئافرەتی قژ زیوی یا پلاتینی

**platitude** (plat′ə-tōōd′, plat′ə-tūd′), *n.* (١) پەڕپووتی و ووشكی و بێ تامی (ووتە). (٢) تێبینی یا ووتەی پەڕپووت و بێ تام و هیچ و پووچ: *( He speaks in ~s.)* .

**platitudinize** (plat′ə-dōō′d'n-īz′, plat′ə-tū′d'n-īz′), *v.i.* زۆر ووتەی پەڕپووت و بێ تام بەكارهێنان لە نووسین و دوواندا.

**platitudinous** (plat′ə-tōō′d'n-əs, plat′ə-tū′d'n-əs), *adj.* پەڕپووت و ووشك و بێ تام (ووتە، تێبینی).

**Plato** (plā′tō), *n.* ئیفلاتوون: فەیلەسووفی بەناوبانگی یۆنانی.

**Platonic** (plə-ton′ik, plā-ton′ik), *adj.* (١) ئیفلاتوونی: تایبەتی بە ئیفلاتوون و فەلسەفەكەی؛ لەسەر پەیڕەوی فەلسەفەی ئیفلاتوونی.
(٢) نەكردەنی؛ نموونەیی؛ خەیاڵی.
(٣) پاك (خۆشەویستی)؛ هی خۆشەویستی وەك خوشك و برایەتی:
*( P~ love)*
-platonically *(adv.).*

**Platonic love,** خۆشەویستی پاكی نێوان كوڕ و كچ یا ژن و پیاو بەبێ جووت بوون؛ خۆشەویستی پاكی وەك هی خوشك و برایەتی.

**Platonism** (plā′t'n-iz'm), *n.* (١) فەلسەفەی ئیفلاتوونی.
(٢) ووتەیەك یا بیروڕایەكی وەرگیراو لە فەلسەفەی ئیفلاتوونی.
(٣) فەلسەفەی خۆشەویستی پاكی نێوان ژن و پیاو.

**Platonist** (plā′t'n-ist), *adj.* ئیفلاتوونی.
*n.* ئیفلاتوونی؛ كەسێكی ئیفلاتوونی؛ پەیڕەویكەری فەلسەفەی ئیفلاتوونی؛ قوتابی فەلسەفەی ئیفلاتوونی.

**Platonize** (plā′t'n-īz′), *v.i.* لەسەر فەلسەفەی ئیفلاتوون ڕۆیشتن.
*v.t.* بەرگی ئیفلاتوونی بەبەرداكران؛ وەك فەلسەفەی ئیفلاتوونی لێكردن.

**platoon** (plə-tōōn′), *n.* (١) پەل (لەشكر).
(٢) دەستە؛ تاقم (فوتبۆڵی ئەمەریكی).

**platter** (plat′ẽr), *n.* (١) بەلەم (چێشت)؛ تەبەق.
(٢) [Slang]، سەرشار (یاری بیسبۆل). (٣) [Slang]، قەوان.

**platy-** (plat′i), پێشگرێكە بەمانای: پان؛ فراوان؛ تەخت.

**platypus** (plat′ə-pəs), *n.* = **duckbill.**

**platyrrhine** (plat′ə-rin′), *adj. Also* **platyrrhinian,** لووتپانی كوونەلووت لەیەكەوە دوور.
*n.* كەسێك یا مەیموونێكی لووت پانی كوونەلووت لەیەكەوە دوور.

**plaudit** (plô′dit), *n.pl.* (١) چەپڵە؛ چەپڵەلێدان (نیشانەی پەسەندكردن). (٢) پەسەندكردن؛ بەدڵ بوون؛ ستایش.

**plausible** (plô′zə-b'l), *adj.* (١) ڕێی تێ دەچێ؛ بەجێ؛ لەوانەیە؛ لەوانەیە وا بێ یا ڕاست بێ: *( a ~ excuse, story, etc.)* .
(٢) ڕووكەش جوان؛ دووڕكوژ؛ سڕۆزنە؛ بە ڕواڵەت تەواو.
(٣) شایستەی بڕواپێكردنە.
-plausibility *(n.)*; plausibleness *(n.)*; plausibly *(adv.).*

**plausive** (plô′siv), *adj.* (١) پەسەندكەر؛ چەپڵە بۆ لێدەر.
(٢) [Obs.]، **plausible** .

**play** (plā), *v.i.* (١) شەكینەوە:
*( Sunlight ~s on the waves.)*
(٢) یاری كردن؛ گەمەكردن.
(٣) قوماركردن؛ یاری كاغەزكردن.
(٤) دەستبازی كردن؛ چاوباشقاڵی كردن.
(٥) ( **with** ~ )، یاری پێكردن؛ گاڵتەپێكردن؛ بەلاسەرلایی گرتن:
*( to ~ with someone's emotions)*
(٦) ژەندن؛ لێدان (ئامێری مۆسیقی).
(٧) دەنگدانەوە (ئامێری مۆسیقی)؛ دەنگ لێ هاتنە دەرەوە.
(٨) بەشێوەیەكی تایبەتی جووڵانەوە یا ڕەووشت بینین.
(٩) نوواندن لەسەر شانۆ؛ دەوربینین لە شانۆگەریدا.
(١٠) بەباشی دەنوێنرێ؛ بۆ نوواندن دەگونجێ؛ باش دەژەنرێ:
*( The new piano ~s well.; That drama ~s well.)*
(١١) پیشان دەدرێ؛ دەنوێنرێ: *( A new movie is ~ing tonight.)* .
(١٢) بەئاسانی و سەربەستی بزوان (پارچەكانی مەكینە).

(١٢) (on; ~ over ~)، بەردەوام بوون لەسەر؛ پەیتاپەیتا کردنەوە.

***v.t.*** (١) یاری کردن؛ گەمەکردن. (٢) ملەملێ کردن.

(٣) یاریەیەکی تایبەتی بە یاریکەر کردن:

*( The coach ~ed him at center.)*

(٤) کردن (بۆ سەیر یا فێڵ لێکردن)؛ پێ هەڵسان: *( to ~ tricks)* .

(٥) (ا) گرەوکردن (ب) گرەو لەسەرکردن: *( ~ the horses)* .

(٦) بزواندن؛ گێران؛ کارپێکردن.

(٧) بوون بە هۆ؛ کردن: *( ~ havoc)* .

(٨) ژەندن؛ لێدان: *( to ~ the piano)* .

(٩) نواندن لە شانۆگەریدا؛ ڕۆڵ بینین لە شانۆگەریدا؛ گێران:

*( to ~ Hamlet)*

(١٠) لاسایی کردنەوە؛ بە درۆ نواندن؛ خۆکردن بە؛ وا خۆدەرخستن:

*( to ~ soldier)*

(١١) لەسەر شانۆ نواندن یا ژەندن:

*( They ~ed U.S. cities for three months.)*

(١٢) (on; ~ over ~)، پەیتاپەیتا لێ دەرهێنان یا فڕێدان.

***n.*** (١) جووڵەحوون؛ جووڵەی خێرا خێراو ئازاد: *( the ~ of muscles)* .

(٢) سەربەستی بزواندن؛ مەودای جووڵەو کار.

(٣) یاری؛ گەمە؛ وەرزش.

(٤) گاڵتە؛ یاری: *( to do a thing in ~ )* .

(٥) یاری کردن؛ گەمەکردن. (٦) شێوەی یاری کردن.

(٧) مناوەرەیەك یا جووڵانەوەیەکی تایبەتی لە یارییەکدا.

(٨) نۆبەی یاری کردن. (٩) قومار.

(١٠) شانۆگەری؛ شانۆنامە؛ شانۆیی.

**make a play for,** [Colloq.], (١) هەوڵی دڵفڕاندن دان.

(٢) زۆر هەوڵی دەستکەوتن دان.

**play along,** [Colloq.], بەشداری کردن لە کارێکدا ئەگەرچی بە نابەدڵیش بێ.

**play at,** (١) بەشداری تێداکردن.

(٢) بە نیوە بەدڵی کردن؛ هەر بەناو کردن؛ بە درۆوە کردن؛ بە گاڵتە گرتن؛ یاری پێکردن

**play down,** لە گرنگی یا بایەخ کەمکردنەوە؛ بە کەمتر پیشاندان:

*( to play down one's failings)*

**play dumb,** خۆ گێل کردن

**played out,** (١) تەواوبوو؛ کۆتایی هاتوو.

(٢) ماندوو؛ پرووکاو؛ هێز لێ براو. (٣) کۆنباو؛ کۆن.

**play fair,** بەویژدان بوون؛ بە سەرڕاستیو ویژدانەوە لەگەڵ خەڵکدا جووڵانەوە

**play for time,** هەوڵی دواخستنی شتێك دان بۆ سوود وەرگرتن لە کات.

**play into the hands of,** بە جۆرێك ڕەفتارکردن یا کارکردن کە ببێتە هۆی سوود گەیاندن بە ناحەز یا هاوچاو.

**play off,** (١) دان بەیەکدا؛ دان بە شەڕ:

*( to play off one group against another)*

(٢) کایەیەکی تر یاری کردن ئەگەر دووتیپ بەرامبەر بوون تاوەکو یەکێکیان یارییەکە بباتەوە

**play on ( or upon ),** بەکارهێنانی کەسێك یا بارێك بۆ سوودی نارەوای خۆ: *( He played on her sympathies.)* .

**play one's cards well,** بە زیرەکانە جووڵانەوە؛ بە وریایانەو لێهاتووانە شت کردن.

**play out,** (١) تەواوکردن؛ هەتا دوایی و تەواوبوونی شتێك لەگەڵدا مانەوە یا کردن. (٢) قوتارکردن؛ هیچ نەهێشتنەوە؛ تەواوکردن.

**play second fiddle,** خواردەستی کردن؛ پاشکۆیەتی کردن.

**play up,** [Colloq.], پێوەنان؛ دانەدەم؛ فشەکردن؛ زیادە خستنەسەر؛ بە گرنگتر یا بایەختر پیشاندان: *( to play up one's successes)* .

**play upon words,** ووشە بە دوو مانا بەکارهێنان؛ یاری بە ووشە کردن.

**play up to,** [Colloq.], مەرایی بۆ کردن؛ خۆ لێ نزیك کردنەوە.

**playa** (plä'yə), ***n.*** (١) کەنار ڕووبار؛ کەنار دەریا.

(٢) بنی دەریاچەی ووشك بوو؛ چاڵاییەکی گەورەی بیابان کە لە دوای باران بارین پڕ دەبێ لە ئاو.

**playbill** (plā'bil´), ***n.*** (١) ئاگاداری شانۆنامەیەك؛ بڵاونامەی شانۆگەرییەك. (٢) بەرنامەی نواندنی شانۆگەرییەك.

**playboy** (plā'boi´), ***n.*** [Colloq.], کەیفخواز؛ کەسێکە کە هەمیشە خەریکی ڕابواردنە بەتایبەتی لەگەڵ ئافرەتدا.

**play-by-play** (plā'bī-plā´), ***adj.*** کایە بە کایە؛ ووردو دوورودرێژ (باس): *( a ~ description of a game)* .

**player** (plā'ēr), ***n.*** (١) یاریکەر؛ وەرزشەوان: *( a football ~ )* .

(٢) actor . (٣) مۆسیقالێدەر؛ سازژەن. (٤) قومارچی؛ قومارکەر.

(٥) ئامێری پیانۆژەندن؛ ئامێری پیانۆ لێدان.

(٦) بە سووك شت گرتوو؛ بێباك.

**player piano,** پیانۆی ئۆتۆماتیکی؛ پیانۆیەکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بۆ خۆی لێدەدات

**playfellow** (plā'fel´ō), ***n.*** = **playmate.**

**playful** (plā'fəl), ***adj.*** (١) حەزکەر لە یاری؛ بزێو؛ ڕووخۆش: *( a ~ child, dog, filly, etc.)* (٢) قۆشمە؛ قۆشمەچی؛ نوکتەباز.

**playgoer** (plā'gō´ēr), ***n.*** حەزکەر لە شانۆ؛ کەسێکە کە زوو زوو دەچێت بۆ شانۆ.

**playground** (plā'ground´), ***n.*** (١) یاریگا (بەتایبەتی هی منداڵان).

(٢) مەیدانی چالاکی بەربەرەڵا

**play hooky,** خۆدزینەوە لە قوتابخانە یا لە کار.

**playhouse** (plā'hous´), ***n.*** (١) شانۆ.

(٢) خانووی یاری منداڵان؛ یاریگای منداڵان (خانوو).

(٣) خانووی بووکەشووشە.

**playing cards,** کاغەزی قومار؛ کاغەزی یاری.

**playing field,** وەرزشگا؛ یاریگا.

**playlet** (plā'lit), ***n.*** شانۆگەرییەکی کورت.

**playmate** (plā'māt´), ***n.*** هاوەل یاری؛ هاوڕێی یاری.

**play-off** (plā'ôf´), ***n.*** (١) دوا یاری نێوان دوو تیپی وەرزشی بەرامبەر بۆ بردنەوەی لایەکیان. (٢) دوا یاری پاڵەوانێتی وەرزشی.

**playpen** (plā'pen´), ***n.*** یاریگای بچووکی بەئاسانی گوێزراوەی منداڵی کۆرپە.

**playroom** (plā'rōōm´, plā'room´), ***n.*** ژووری یاری.

**plaything** (plā'thiŋ´), ***n.*** (١) بووکەشووشە؛ شتی یاری پێکراو.

(٢) کەسێکی یاری پێکراو

**playtime** (plā'tīm´), ***n.*** کاتی یاریو ڕابواردن.

**playwright** (plā'rīt´), ***n.*** شانۆگەر؛ نووسەری شانۆ؛ شانۆنامەنووس.

**plaza** (plaz-ə, plä'zə), ***n.*** گۆڕەپانی ناوشار؛ مەیدانی گشتی؛ بازاڕ.

**plea** (plē), ***n.*** (١) بەڵگە؛ بیانوو؛ بروبیانوو

(٢) پاڕانەوە؛ داوا؛ داواکردن؛ تکاکاری: *( a ~ for mercy)* .

(٣) دادخوازی (لەلایەن گومانبارەوە لە دادگادا)؛ هەوڵی گومان یا تاوان لەسەر خۆ لابردن.

**pleach** (plēch), ***v.t.*** تەنین (خەڵەفدار)؛ هۆنینەوە.

**plead** (plēd), ***v.i.*** (١) دادخوازی کردن (لە دادگادا)؛ بەڵگەهێنانەوە بۆ گومانبار یا دژی

(٢) وەڵام دانەوەی گومان لە دادگادا: *( to ~ not guilty; to ~ guilty)*

(٣) پاڕانەوە؛ تکاکردن: *( to ~ for mercy)* .

***v.t.*** (١) دادخوازی کردن (لە دادگادا). (٢) وەڵام دانەوەی گومان لە دادگادا

(٣) بەڵگەهێنانەوە؛ کردن بە بەڵگە یا بیانوو: *( to ~ ignorance)* .

-**pleader** *(n.).*

**pleadings** (plēd'iŋz), ***n.pl.*** داوای داواچیو وەڵامی گومانبار (دادگا)

**pleasance** (plez′'ns), *n.* (١) [Archaic] خۆشی؛ شادی؛
هۆی خۆشی‌و شادی. (٢) باخچە یا سەیرانگای کۆشکێك.
**pleasant** (plez′'nt), *adj.* (١) خۆش
*( a ~ evening, voice, place, etc.)*
(٢) ڕووخۆش؛ ناسك. *( a ~ person, companion, etc.)*
(٣) کەیف خۆش؛ قۆشمە.
**-pleasantly** *(adv.)*; **pleasantness** *(n.)*.
**pleasantry** (plez′'n-tri), *n.* (١) قسەخۆشی؛ قۆشمەیی؛
سەیرخۆشی. (٢) قسەی خۆش؛ گاڵتەوگەپ.
**please** (plēz), *v.t.* (١) دڵخۆش کردن؛ دڵ ڕاگرتن؛ ڕازی کردن:
*( It's difficult to ~ everybody.)*
(٢) حەزکردن؛ ویستن.
*v.i.* (١) دڵخۆش کردن؛ دڵ ڕاگرتن؛ ڕازی کردن: *( We aim to ~ .)*.
(٢) ویستن؛ حەزکردن؛ هەوەس بوون: *( I'll do as I ~ .)*.
(٣) تکایە؛ فەرموو؛ بێ زەحمەت؛ توخوا!. *( P~ don't forget the key.; Won't you ~ come in?; Coffee for two, ~ .; Come in, ~ .)*
**if you please,** تکایە؛ بە ئارەزووی تۆ؛ بێ زەحمەت
**please oneself,** بە هەوەسی خۆ جوڵانەوەو ڕەفتارکردن؛
بە دڵی خۆ کردن؛ چی دەوێ دەیکات.
**pleasing** (plēz′iŋ), *adj.* خۆش؛ جوان؛ دڵخۆشکەر
**pleasurable** (plezh′ēr-ə-b'l), *adj.* خۆش؛ دڵخۆشکەر
*( a ~ experience)*
**-pleasurableness** *(n.)*; **pleasurably** *(adv.)*.
**pleasure** (plezh′ēr), *n.* (١) خۆشی؛ لەزەت؛ هەستی خۆشی
(٢) حەز؛ ویست: *( What is your ~ ?)*.
(٣) هۆی خۆشی؛ مایەی خۆشی؛ شتی لەزەت پێدەر. (٤) ڕابواردن؛ کەیف.
*v.t.* [Archaic]. دڵخۆش کردن؛ ڕازی کردن؛ دڵ ڕاگرتن.
*v.i.* [Archaic]. پێ خۆش بوون؛ خۆشی لێ بینین.
**pleat** (plēt), *n.* لۆچ (تەنوورەو جلی تر، پەردە... هتد)؛
دەق یا تووی گێزوگوڵنگ‌و بەرگ.
*v.t.* لۆچ لۆچ کردن (پەردە، جل‌وبەرگ)؛ دەق یا توێ تێخستن.
**pleb** (pleb), *n.* (١) plebian . (٢) plebe .
**plebe** (plēb), *n.* (١) plebian .
(٢) قوتابی پۆلی یەکەمی دانشگای ئەفسەری‌و ئەفسەری دەریایی ئەمەریکا.
**plebeian** (pli-bē′ən), *n.* (١) بۆرەپیاوی ڕۆمای کۆن.
(٢) بۆرەپیاو؛ هەرچی‌وپەرچی؛ ڕەش‌وڕووت.
(٣) کەسێکی بێ نەزاکەت، ناکەس، یا کەرتر.
*adj.* (١) هی بۆرەپیاوانی ڕۆمای کۆن. (٢) بۆرەپیاوی؛ هی بۆرەپیاو.
(٣) بێ نەزاکەت؛ نزم؛ ناکەس؛ نەزان؛ ڕەشۆکی: *( ~ tastes)*
**-plebeianism** *(n.)*.
**plebiscite** (pleb′ə-sit′, pleb′ə-sit), *n.* ڕاپرسی؛ ڕاپرسین؛
ڕاپرسی گەل.
**plebs** (plebz), *n.* (١) چینی ڕەش‌وڕووتی ڕۆمای کۆن؛ بۆرەپیاوانی
ڕۆمای کۆن. (٢) بۆرەپیاوان؛ ڕەش‌وڕووت
**plectrum** (plek′trəm), *n.* پەڕی گیتار‌و عوود لێدان.
**pledge** (plej), *n.* (١) بارمتە. (٢) بەڵێننامە. (٣) نۆش
(٤) پێشەکی بەڵێنی وەرگرتن بە ئەندامی تازەی ڕێکخراوی قوتابی کوڕان
یا کچانی زانکۆ
*v.t.* (١) بارمتە دانان. (٢) بەڵێندان. (٣) بەڵێن لێ وەرگرتن؛ بەستنەوە بە بەڵێن.
(٤) بە نۆشی گیانی کەسێکەوە خواردنەوە
(٥) (ا) بەڵێندان بە بوون بە ئەندامی ڕێکخراوی قوتابی کوڕان یا کچانی زانکۆ.
(ب) بەڵێندان بە وەرگرتن بە ئەندامی ڕێکخراوێکی وەها
**take the pledge,** سوێندخواردن یا بەڵێندان بە ئیتر نەخواردنەوەی
خواردنەوەی سەرخۆشکەر.
**pledgee** (plej′ē′), *n.* (١) بەڵێن پێدراو؛ بەڵێن وەرگر
(٢) بارمتەگر؛ بارمتەوەرگر.
**pledgeor** (plej′ôr′), *n.* = **pledgor.**
**pledger** (plej′ēr), *n.* بەڵێندەر.
**pledget** (plej′it), *n.* سارغی؛ شتی برین پێچان.
**pledgor** (plej′ôr′), *n.* بارمتەدانەر؛ بارمتەدەر.
**-plegia** (plē′ji-ə), پاشگرێکە بەمانای: ئیفلیجی؛ گۆجی؛ گێڕی:
*( paraplegia)*
**Pleiades** (plē′ə-dēz′, plī′ə-dēz′), *n.pl.* (١) حەوت کچەکەی
" ئەتلەس " کە بوون بە ئەستێرە (ئەفسانەی یۆنانی).
(٢) کۆئەستێرەیەکە شەش ئەستێرەی بە چاو دەبینرێ.
**plenary** (plē′nə-ri, plen′ə-ri), *adj.* (١) تەواو؛ بێ سنوور؛ ڕەها:
*( a diplomat with ~ powers)*
(٢) گشتی (کۆبوونەوە)؛ فراوان؛ بۆ هەموو ئەندامان:
*( a ~ meeting, session, congress, etc.)*
**plenary indulgence,** تەواو بەخشینی گوناهبار (ئاینی کاسۆلیکی).
**plenipotentiary** (plen′i-pə-ten′shə-ri), *adj.* دەسەڵاتداری
گشتی؛ دەسەڵاتداری بێ سنوور.
*n.* باڵوێز یا نوێنەی دبلۆماسی تری دەسەڵاتداری گشتی.
**plenitude** (plen′ə-tōōd′, plen′ə-tūd′), *n.* (١) تەواوی؛ پڕی؛
لە هیچ کەم نەبوون. (٢) زەبەنەیی؛ زۆری؛ فرەیی؛ مشەیی.
**plenteous** (plen′ti-əs), *adj.* (١) زەبەنە؛ زۆر؛ فرە؛ مشە.
(٢) بەپیت؛ بەبەر؛ زۆر بەبەر.
**plentiful** (plen′ti-fəl), *adj.* (١) زۆروزەبەنە؛ زەبەنە؛ فرە؛ زۆر؛ مشە.
(٢) بەپیت؛ بەبەر؛ زۆر بەبەر: *( a ~ harvest)*.
**-plentifully** *(adv.)*; **plentifulness** *(n.)*.
**plenty** (plen′ti), *n.* (١) خۆش گوزەرانی.
(٢) زۆروزەبەنەیی؛ مشەیی؛ زەبەنەیی.
*adj.* زۆروزەبەنە؛ مشە؛ فرە.
*adv.* [Colloq.], زۆر؛ ئێجگار: *( It's ~ hot, good, bad, etc.)*.
**plenum** (plē′nəm), *n.* (١) شوێنی پڕ؛ جێی پڕ. (٢) پڕی؛ پڕێتی.
(٣) کۆبوونەوەی هەموو ئەندامان؛ کۆبوونەوەی گشتی یا فراوان.
(٤) شوێنێکە کە پەستانی گاز یا هەوا تیایدا زیاترە لە دەوروپشتەکەی
**pleonasm** (plē′ə-naz'm), *n.* (١) ئاخنینی قسە بە وشەی زیادە؛
زۆر وشە بەکارهێنان بۆ دەربڕینی بیروڕایەك.
(٢) نموونەیەکی ئەم قسە ئاخنینە بە وشەی ناپێویست.
(٣) وشەی ناپێویست؛ وتەی زیادە.
**plessor** (ples′ēr), *n.* = **plexor.**
**plethora** (pleth′ə-rə), *n.* (١) زۆروزەبەنەیی؛ ئێجگار زۆری؛
زیاد لە پێویست: *( a ~ of rules and regulations)*.
(٢) نەخۆشی زۆربوونی خوێن لە ئەندامێك یا ناوچەیەکی لەشدا؛ نەخۆشی
زۆربوونی خڕۆکەی سوور لە خوێندا.
**-plethoric** *(adj.)*; **plethorically** *(adv.)*.
**pleura** (ploor′ə), *n.* پەردەی سی.
**pleural** (ploor′əl), *adj.* هی پەردەی سی.
**pleurisy** (ploor′ə-si), *n.* ئاوسانی پەردەی سی؛ سینەپاڵوو.
**pleuritic** (ploo-rit′ik), *adj.* پەردەی سی‌ی ئاوساوە؛
تایبەتی بە ئاوسانی پەردەی سی.
**pleuro-** (ploor′ō, ploor′ə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) لا؛ تەنیشت.
(ب) هی پەردەی سی
**pleuropneumonia** (ploo′rō-nōō-mō′ni-ə, ploo′rō-nū-mō′ni-ə), *n.* جووت نەخۆشی‌ی پزوو ئاوسانی پەردەی سی؛ ئاوسانی سی‌و
پەردەی سی.
**plexiform** (plek′sə-fôrm′), *adj.* (١) لە تۆڕ دەچێ. (٢) ئاڵۆز.
**plexiglass** (plek′si-glas′, plek′si-gläs′), *n.* پلاستیکێکی
ڕووناکە وەك شووشەی پەنجەرە (گەلێك جار لەباتی شووشە بەکاردەهێنرێ)

**plexor** (plek′sẽr), *n.* چەکوشێکی بچووکی سەر لاستیکی پشکنینی پزیشکییە

**plexus** (plek′səs), *n.* (١) کۆدەماری خوێن و هەستەدەماری وەك تۆڕ تەنراو. (٢) تۆڕ؛ شتی تەنراو یا ئاڵۆز.

**pliability** (plī′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) بە ئاسانی نووشتانەوە؛ نەرمی؛ چەکوشخۆری؛ شلکی. (٢) بە ئاسانی ڕاهاتن (لەگەڵ باری تازەدا)؛ بە ئاسانی گۆڕان یا کارتێکران.

**pliable** (plī′ə-b'l), *adj.* (١) نەرم؛ بە ئاسانی نووشتاوە؛ چەکوشخۆر؛ شلك. (٢) (ا) بە ئاسانی ڕاهاتوو یا گۆڕاو. (ب) بە ئاسانی کارتێکراو؛ نەرم (مرۆڤ)

**-pliablenss** *(n.)*; **pliably** *(adv.)*.

**pliancy** (plī′ən-si), *n.* نەرمی (شت، مرۆڤ).

**pliant** (plī′ənt), *adj.* (١) نەرم؛ بە ئاسانی نووشتاوە. (٢) بە ئاسانی ڕاهاتوو یا گۆڕاو؛ زوو کارتێکراو. (٣) ملکەچ؛ مندەر.

**plica** (plī′kə), *n.* (١) لۆچ (پێست)؛ توێ. (٢) نەخۆشی قژ.

**plicate** (plī′kāt), *adj.* باوەشێنی (گەڵا)؛ لۆچ لۆچ.

**plication** (plī-kā′shən, pli-kā′shən), *n.* (١) لۆچ لۆچ کردن؛ لۆچ تێخستن. (٢) لۆچ؛ توێ؛ قەد. (٣) چین (زەمینناسی)؛ توێ.

**pliers** (plī′ẽrz), *n.pl.* گازێکی لووت درێژە بۆ تەل گرتن و چەماندنەوە و قرتاندن؛ گاز؛ پلایس.

**plight** (plīt), *n.* کێشە؛ بارێکی دژوار؛ بارێکی زۆر ناخۆش و مەترسیدار: *( the ~ of refugees)*

**plight** (plīt), *v.t.* (١) بەڵێندان؛ پەیماندان. (٢) دیاریکردن (ژنهێنان)؛ نیشانەکردن؛ بەڵێنی هێنان دان.

**plight one's troth,** (١) بەڵێندان؛ پەیماندان. (٢) بەڵێنی هێنان دان؛ دیاریکردن؛ نیشانەکردن.

**plinth** (plinth), *n.* (١) بنی پایە و کۆڵەکە. (٢) بنی پەیکەر و گولدان.

**plod** (plod), *v.i.* (١) هەنگاوی هێواش و قورس هەڵهێنانەوە؛ بە تەپەتەپ و زەحمەت و هێواشی ڕۆیشتن: *( to ~ on one's way)*. (٢) ئیشی ووشك و ناخۆش کردن؛ ئارەق ڕشتن.

*n.* (١) بە تەپەتەپ و هێواشی ڕۆیشتن. (٢) تەپەتەپی پێ؛ دەنگی پێ. (٣) هەنگاوی قورس.

**plodder** (plod′ẽr), *n.* (١) کەسێك کە بە تەپەتەپ و هێواشی دەڕوات؛ هەنگاوی قورس (٢) ئیشکەرێکی سست و بەردەوام؛ کەسێکی ووشك و سست؛ قوتابی سست و کۆششکەر.

**plop** (plop), *v.t. & v.i.* تەپە لێوەهاتن

*n.* تەپە (وەك دەنگی شتێك کە بکەوێتە ناو ئاوەوە).

**plosion** (plō′zhən), *n.* (١) بێژان یا پرتاندنی تیپی وەك ( p, k ) لە سەرەتای ووشەدا. (٢) لەپڕ دەرپەڕینی هەوا لە ئەنجامی پرتاندنی ئەم تیپانەدا.

**plosive** (plō′siv), *adj.* تایبەتی بە دەنگێکە کە بێژانی پێویست دەکات بە وەستانی هەناسە و لەپڕ دەرپەڕینی هەوا لە دەمەوە (وەك تیپی: ( p, k, t, d لە سەرەتای ووشەدا (دەنگزانی).

*n.* دەنگێکی وەها.

**plot** (plot), *n.* (١) پەڵە زەوی؛ پارچە زەوی. (٢) نەخشەی خانوو. (٣) پیلان؛ داو؛ نەخشەیەکی نهێنی و ناپەسەند. (٤) نەخشەی چیرۆك، داستان، یا شانۆگەری.

*v.t.* (١) نەخشەی خانوو کێشان؛ ڕەنگ ڕشتن؛ نەخشەدانان. (٢) پیلان گێڕان؛ نەخشەکێشان: *( to ~ someone's destruction)*. (٣) نەخشەدانان بۆ چیرۆك، داستان، یا شانۆگەری.

*v.i.* نەخشەکێشان؛ نەخشەدانان؛ پیلان دانان.

**plottage** (plot′ij), *n.* ڕووبەری پەڵە زەوی.

**plotter** (plot′ẽr), *n.* پیلانگێڕ؛ پیلانباز.

**plough** (plou), *n., v.t. & v.i.* = plow.

**plover** (pluv′ẽr, plō′vẽr), *n.* زیقاوڵە؛ باڵندەیەکی گوێ دەریای کلك کورتی بۆرە نەوەندەی کۆترێك دەبێ.

**plow** (plou), *n. Also* **plough,** (١) هەوجار. (٢) بەفرماڵ. (٣) [P-]، ناوی کۆنەستێرەیەکە.

*v.t.* (١) کێڵان؛ زەوی کێڵان. (٢) دڕینەدان؛ بەناودا ڕۆیشتن؛ ڕێی خۆ کردنەوە: *( He ~ed his way through the crowd.)* (٣) بەفرماڵین؛ لابردن بە بەفرماڵ. (٤) کێڵان (مەجاز)؛ بەناودا ڕۆیشتن؛ ڕێ کردنەوە؛ ڕێ بڕین: *( The ship ~s the waves.)*

*v.i.* (١) کێڵان؛ زەوی کێڵان؛ گاسن لێدان. (٢) کێڵران: *( The field ~s well.)*. (٣) هەڵدڕین؛ بەناودا ڕۆیشتن؛ ڕێکردنەوە. (٤) بە سستی و بە زەحمەت ڕۆیشتن.

**plow back,** قازانج خستنەوە ئیش لەگەڵ مایەدا.

**plow into,** (١) بە توندی لێدان (٢) بە چوست و چالاکی دەستکردن بە ئیش؛ بەپەرۆشەوە ئیشکردن؛ بە گەرمی دەستپێکردن.

**plow the sands,** کاری بێ سوود کردن.

**plowboy** (plou′boi′), *n.* (١) جووتیار. (٢) کوڕەلادێیی.

**plowland** (plou′land′), *n.* (١) ئەوەندە زەوی‌وزار کە بە هەشت گا بکێڵرێ لە ساڵێکدا. (٢) زەوی‌وزاری چێنراو؛ زەوی بەکارهێنراو بۆ کشتوکاڵ؛ زەوی شیاو بۆ کشتوکاڵ.

**plowman** (plou′mən), *n.* (١) جووتیار. (٢) وەرزێر؛ کشتیار.

**plowshare** (plou′shâr′), *n.* گاسن.

**ploy** (ploi), *n.* فێڵ؛ فێڵ‌وتەڵەکە؛ مناوەرە: *( The threat was merely a bargaining ~ .)*

**pluck** (pluk), *v.t.* (١) قرتاندن؛ لێکردنەوە؛ ڕنین: *( to ~ a flower)*. (٢) ئاوەڕووت کردن؛ پەڕلێکردنەوە: *( to ~ a chicken)*. (٣) ڕاکێشان؛ ڕاتەکاندن؛ هەڵپچورقاندن: *( to ~ a sleeve)*. (٤) لێدان (ژێی عوود و گیتار)؛ ڕاکێشان و بەرەڵاکردن پەیتاپەیتا. (٥) [Slang]، خەڵەتاندن؛ دەستبڕین؛ لە خشتە بردن. (٦) [British Slang]، نەویستنی کەسێك پاش تاقیکردنەوەی.

*v.i.* **( ~ at ),** ڕاتەکان؛ هەڵپچورقان؛ ڕاکێشان.

*n.* (١) ڕاتەکان؛ هەڵپچورقان؛ ڕاکێشان. (٢) دڵ و جگەر و سی‌ی گیاندار (بۆ خواردن). (٣) ئازایی؛ غیرەت.

**pluck up one's heart, spirit, or courage,** غیرەت گرتن؛ خۆ کورج کردنەوە؛ ئازابوون؛ زات ئانەبەر خۆ.

**plucky** (pluk′i), *adj.* ئازا؛ بەجەرگ؛ چاونەترس؛ دلێر.

**plug** (plug), *n.* (١) دەمەوانە؛ تۆپەوانە؛ پشك. (٢) (ا) تۆپەڵە تووتنی پەستێوراو. (ب) تۆپەڵە تووتنی جووین. (٣) پلاکی کارەبا. (٤) پلاکی ئوتومبیل. (٥) **fireplug** . (٦) [Slang]، **plug hat** . (٧) [Slang]، شتێك یا گیاندارێکی بێ کەڵك بەتایبەتی ئەسپی پەککەوتە. (٨) [Slang]، گوللە: *( a ~ in the back)* . (٩) [Slang]، (ا) پروپاگەندە بۆ برەوپێدان و فرۆشتنی شتێك (بەتایبەتی کە لە زیادە بخرێتە ناو بەرنامەیەکی رادیۆ یا تەلەفزیۆنەوە). (ب) برەودان بە کەسێك. (١٠) تلەبەردی گەورەی ئاگرپرژێن کە دەمی ئاگرپرژێنەکە دەگرێ.

*v.t.* (١) ( ~ up )، بەرگرتن بە دەمەوانە؛ بەربەستن؛ گرتن (کون)؛ تۆپەوانە تێخستن. (٢) پلاك پێداکردن. (٣) قاشێکی بچکۆلە لە کاڵەك کردنەوە بۆ تاقیکردنەوەی. (٤) [Slang]، گوللە لێدان؛ پێکان. (٥) [Slang]، مستەکۆڵە لێدان (٦) [Slang]، بانگ بۆ دان و برەوپێدان (بەتایبەتی لەسەر رادیۆ و تەلەفزیۆن) *( to ~ a product or a cause on television)*

*v.i.* (١) [Colloq.] ، بە سستی و بەردەوام ئیشکردن؛ ئارەق ڕشتن. (٢) [Slang]، گوللە تێگرتن؛ گوللە پێوەنان.

**plug in,** پلاکی کارەبا کردن بە سۆکێتدا؛

ئامێری کارەبایی گەیاندن بە کارەبا بەهۆی پلاکەوە.

-**plugger** *(n.)*.

**plug hat,** [Slang], شەپقەی قووچی ئاوریشمی پیاوانە.

**plug-ugly** (plug′ug′li), *n.* [Slang], شەلاتی؛ بەتایبەتی هی بەکرێ گیراو بۆ بەچەترسێن کردنی خەڵك؛ سێبەندی.

**plum** (plum), *n.* (١) دارهەڵووژە. (٢) هەڵووژە. (٣) مێووژی ناو کێك (٤) ڕەنگی هەڵووژەیی؛ ڕەنگی ئەرخەوانی یا سووری تێر. (٥) شتێکی نایاب؛ شتێکی زۆر باش و هەڵبژاردە (وەك پلەوپایەیەکی باش بە مووچەی زۆرەوە)؛ خەڵات

**plumage** (ploōm′ij), *n.* پەڕی باڵندە؛ پەڕ.

**plumate** (ploō′māt, ploō′mit), *adj.* لە پەڕ دەچێت

**plumb** (plum), *n.* قورسایییەکی قوڕقوشمە بەسەری تاڵە دەزوویەکەوە بەستراوە بۆ دۆزینەوەی قووڵی ئاوو ڕاستی دیوارو شتی تر (پێشی دەووترێ " plumb bob ").

*adj.* ستوونی؛ شاوێڵی

*adv.* (١) بە ستوونی؛ شاوێڵییانە (٢) [Colloq.]، بەتەواوی. *( He is ~ exhausted.)*

*v.i.* (١) ڕاستە، خۆ کەوتنە خوارەوە یا نوقوم بوون (٢) ڕاستەوخۆ شۆڕبوونەوە (٣) قوڕقوشمکاری کردن؛ بۆریکاری کردن

*v.t.* (١) تاقیکردنەوەی ڕاستی دیوار بە قورسایییەکی قوڕقوشمی بەستراو بەسەری تاڵە دەزوویەکەوە. (٢) ~ up ، ڕاستکردنەوە؛ ستوونی کردن (٣) پێوانی قووڵایی؛ قووڵایی دۆزینەوە (٤) لێ ووردبوونەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ تێگەیشتن (٥) مۆرکردن یا داخستن بە قوڕقوشم؛ بە قوڕقوشم لەحیم کردن. (٦) بۆریکاری کردن.

**out of plumb; off plumb,** ناستوونی؛ خوار؛ لار.

**plumbago** (plum-bā′gō), *n.* (١) graphite. (٢) نەخشەیەکی بە قەڵەم کراو (٣) گیا قوڕقوشمی

**plumb bob,** قورسایییەکی قوڕقوشمەیییە بەسەری تاڵە دەزوویەکەوە (بۆ پێوانی قووڵایی و ڕاستی دیوارو شتی تری وەها)

**plumbeous** (plum′bi-əs), *adj.* قوڕقوشمی

**plumber** (plum′ēr), *n.* بۆریچی؛ لوولەچی

**plumber's snake,** تەلێکی ئەستوورە بۆ پاکردنەوەی بۆری گیراوی زێراب و گەرماو

**plumbery** (plum′ēr-i), *n.* (١) بۆریچێتی؛ لوولەکاری؛ لوولەچێتی (٢) کارگەی بۆری دروستکردن؛ کارخانەی لوولە دروستکردن.

**plumbic** (plum′bik), *adj.* قوڕقوشمی؛ قوڕقوشمی تێدایە

**plumbing** (plum′iŋ), *n.* (١) بۆری ئاوو گازو زێرابی ئاومان. (٢) بۆریچێتی؛ لوولەکاری

**plumbism** (plum′biz'm), *n.* ژەهراوی بوون بە قوڕقوشم؛ ژەهری قوڕقوشم تێدران

**plumb line,** (١) پەتێك یا تاڵە دەزوویەکە قورسایییەکی قوڕقوشم بەستراوە بە سەرێکەیەوە بۆ پێوانی قووڵایی و تاقیکردنەوەی ڕاستی دیوار (٢) هێڵی ستوونی

**plumbous** (plum′bəs), *adj.* قوڕقوشمی؛ قوڕقوشمی تێدایە

**plumbum** (plum′bəm), *n.* قوڕقوشم

**plume** (ploōm), *n.* (١) (ا) پەڕێکی زل (باڵندە) (ب) کۆمەڵە پەڕی زل (٢) پەڕێکی زل ڕازێنەرەوە (بەتایبەتی کە دەکرێ بە کڵاو یا تەپلەوە). (٣) خەڵات؛ نیشانەی سەرکەوتن (٤) پەڕی نەرم؛ پەڕ (٥) شتێکی سووك وەك پەڕ (٦) ئەندامێکی لە پەڕ چوو (زیندەوەرزانی).

*v.t.* (١) بە پەڕی زل و جوان ڕازاندنەوە؛ پەڕ پێوەکردن (٢) بە دەنووك پەڕوباڵ ساف و ڕێك کردن (٣) خۆبادان؛ خۆهەڵکێشان؛ خۆهەڵدان

**plumelet** (ploōm′lit), *n.* پەڕی بچووك

**plummet** (plum′it), *n.* (١) plum bob. (٢) بارێکی قورس؛ شتێکی قورس و پەستکەر

*v.i.* (١) کەوتنەخوارەوە بە ستوونی و لەپڕ؛ لەپڕ بەربوونەوە: *( The plane ~ed to earth.)* (٢) لەپڕ شکان (نرخ)؛ لەپڕو بەخێرایی هاتنەخوارەوە؛ داکەوتن: *( Prices ~ed.)*

**plummy** (plum′i), *adj.* (١) هەڵووژەیی. (٢) پڕ لە هەڵووژە. (٣) [Colloq.]، نایاب؛ زۆر باش.

**plumose** (ploō′mōs), *adj.* (١) پەڕاوی؛ پەڕدار. (٢) لە پەڕ دەچێ.

**plump** (plump), *adj.* پان وپۆڕ؛ خڕیلانە؛ گۆشتن؛ خڕین؛ نەختێك قەڵەو.

*v.t. & v.i.* ( ~ up; ~ out ), قەڵەوکردن؛ دابەستن؛ پان وپۆڕ بوون.

-**plumpness** *(n.)*.

**plump** (plump), *v.i.* (١) بەتوندی و لەپڕ کەوتنەخوارەوە؛ لەپڕ بەربوونەوە (٢) بەتوندی و لەپڕ بەرکەوتن یا پیادران.

*v.t.* بەتوندی و لەپڕ خستنەخوارەوە یا فڕێدان.

*n.* (١) (ا) کەوتنەخوارەوەی لەپڕو بەتوندی؛ بەربوونەوەی لەپڕ. (ب) بەقایم بەرکەوتن. (٢) دەنگی ئەم کەوتنەخوارەوەیە یا بەرکەوتنە؛ تەپە؛ زرمە.

*adv.* (١) لەپڕ؛ بەتوندی؛ بەقایمی؛ بەقورسی. (٢) یەکسەر بۆ خوارەوە. (٣) بەبێ پێچ وپەنا؛ لەڕوو (قسە).

*adj.* یەکسەر؛ بەبێ پێچ وپەنا؛ لەڕوو (قسە).

**plump for,** (١) دەنگ بۆ دان. (٢) پاڵپشتی کردن؛ پشتیوانی گرتن

**plump** (plump), *n.* [Archaic or British Dial.], دەستە؛ تاقم.

**plumule** (ploō′mūl), *n.* (١) لاسکی ڕووەکی تازە پشکوتو (٢) وورده پەڕ؛ نەرمە پەڕ

**plumy** (ploō′mi), *adj.* (١) پەڕدار؛ بە پەڕ داپۆشراو؛ بە پەڕ ڕازاوە. (٢) لە پەڕ دەچێ؛ پەڕی.

**plunder** (plun′dēr), *v.t.* تاڵانکردن؛ ڕاوورووت کردن.

*v.i.* دزین.

*n.* (١) تاڵان؛ تاڵانکردن؛ ڕاوورووت کردن (٢) تاڵانی.

-**plunderer** *(n.)*; **plunderous** *(adj.)*.

**plunderage** (plun′dēr-ij), *n.* (١) ڕووتکردنەوە؛ تاڵانکردن؛ ڕاوورووت کردن. (٢) (ا) شت دزین لە کەشتیدا. (ب) شتی دزراو لە کەشتیدا؛ تاڵانی.

**plunge** (plunj), *v.t.* (١) تێخستن (ئاو، شلە، کون)؛ پێداکردن؛ تێ فڕێدان؛ خستنە ناو: *( He ~d his head into the water.)* (٢) تووش کردن؛ پێوەکردن؛ تێ ترنجاندن؛ بە زۆر خستنە ناو بارێکەوە *( to ~ a country into war; They will ~ us into debt.)*

*v.i.* (١) خۆ تێ فڕێدان؛ خۆ تێخستن: *( to ~ into the pool, an argument, a fight, etc.)* (٢) هەڵبەزودابەزکردن؛ تاسەکردن. (٣) لێژبوونەوە (ڕێگە)؛ خل بوونەوە (وەك بەرەوخوارکە) (٤) [Colloq.]، سەرکێشی کردن؛ کاری پڕ مەترسی کردن؛ قومارکردن؛ گرەوکردن.

*n.* (١) شوێنی خۆ تێ فڕێدان؛ گۆماو؛ ئەستێل. (٢) (ا) خۆ فڕێدانە ناو ئاوەوە؛ بازدانە ناو ئاوەوە (ب) مەلە. (٣) پەستانەوە (پستنی مەکینە)؛ داگرتنەوە (٤) [Colloq.]، قومار؛ پارەبازی؛ گرەوکردن

**take the plunge,** بە کارێکی تازەو گرنگ و ئەنجام نەزانراو هەڵسان

**plunger** (plun′jēr), *n.* (١) بازدەرە ناو ئاوەوە؛ خۆ تێ فڕێدەر. (٢) [Colloq.]، سەرکێش؛ هەڵەشە؛ قومارچی؛ بێباك؛ پارەبازی بێباك (٣) پەستێنەر (پستنی مەکینە) (٤) ئامێرێکە بریتییە لە پارچەیەك پلاستیکی بۆشی وەك کووپ بەسەری دارێکەوە بۆری گەرماو و چێشتخانەو زێرابی گیراوی پێ دەپەستێنرێتەوە بۆ بەردانی

**plunk** (pluŋk), *v.t.* (١) لێدانی ژێی ئامێری مۆسیقی وەك عوودو گیتار

(۲) داتان یا فرێدانه خوارەوە بەتوندی.
*v.i.* (۱) زرنگانەوە (ئامێری مۆسیقی). (۲) بەقایم کەوتن و تەپە لێ هەڵسان.
*n.* (۱) لێدان (ژێی عوود و گیتار). (۲) دەنگی ئەم لێدانە.
(۳) [Colloq.]. پیاکێشانێکی قایم. (٤) [Slang]، دۆلار.
**pluperfect** (ploo-pûr′fikt, ploo′pûr′fikt), *adj.* رابوردووی دوور (ڕێزمان): *( He had finished it.; I had known it.)*.
**plural** (ploor′əl), *adj.* (۱) کۆ؛ کۆیی
(۲) کۆ (ڕێزمان): *( a ~ noun)*.
*n.* (۱) کۆ؛ کۆژمارە. (۲) کۆ (ڕێزمان)؛ کۆ شێوەی ووشە.
**pluralism** (ploor′əl-iz′m), *n.* (۱) فرە شێوەیی؛ هەمەجۆری؛ هەمەڕەنگی (۲) فرەکاری؛ گرتنەدەستی زیاتر لە یەک ئیش یا فەرمانبەری لەلایەن کاربەدەستێکی کڵێسەوە (۳) کۆیی.
(٤) هاوژینیی فرە ڕەگەزو ئاین و بیروباوەڕ لە کۆمەڵگایەکدا.
(٥) فرە ڕێبازی و بیروباوەڕو ڕاستی (فەلسەفە).
**pluralist** (ploor′əl-ist), *n.* (۱) کاربەدەستێکی کڵێسەی فرە ئیش.
(۲) پەیڕەویکەری " **pluralism** " (ووشەی پێشوو ببینە).
-pluralistic *(adj.).*
**plurality** (ploo-ral′ə-ti), *n.* (۱) کۆ؛ کۆیی فرەیی؛ زۆری.
(۲) زۆر؛ فرە؛ ڕەبەنە؛ ژمارەیەکی بێ شومار
(۳) (ا) گرتنەدەستی ئیشێك زیاتر لەلایەن کاربەدەستی کڵێسەوە.
(ب) یەکێك لەو ئیشانە. (٤) زۆربە.
(٥) زیادەی ئەو دەنگانەی کە دەدرێت بە براوەی هەڵبژاردنێك لەوەی کە نەدرێت بە دۆڕاوەکە
**pluralize** (ploor′əl-īz′), *v.t.* کۆکردن؛ بەشێوەی کۆ دەربڕین (ڕێزمان)
**plus** (plus), *prep.* (۱) و؛ خراوەسەر؛ کۆکراوە:
*( two ~ two equals four 2+2= 4 )*
*( the salary ~ bonuses)* (۲) لەگەڵ؛ پش؛ هەروەها:
*adj.* (۱) هی نیشانەی کۆکردنەوە؛ هی خستنەسەر؛ هی کۆ:
**[ a ~ sign (+) ]**
*( a grade of B ~ .)* (۲) زیادە (نمرە)
*( a ~ quantity)* (۳) زیادە؛ زیاتر نەك کەمتر:
*( She has personality ~ .)* (٤) [Colloq.]. زیاتریش:
*( the ~ column of an account)* (٥) دەستکەوت (دەفتەرگری)؛ داهات:
(٦) گەرم (کارەبا)
*n.* (۱) نیشانەی خستنەسەر یا کۆکردنەوە (+) .
(۲) شتی خراوەسەر؛ شتی زیادە. (۳) زیادە.
**plus fours,** پانتۆلی دەلنی هەتا ئەژنۆ (بۆ وەرزش بەتایبەتی گۆلف).
**plush** (plush), *n.* قوماشی کوڵکن یا تووکن
*adj.* (۱) کوڵکن؛ لە قوماشی کوڵکن یا تووکن دروستکراو.
(۲) [Slang]. فەنتازی؛ کەشخە؛ بە تێروتەسەلانە دروستکراو (کەرەسەی ناومال) *( a ~ carpet, house, etc.)*.
**plushy** (plush′i), *adj.* (۱) لە قوماشی کوڵکن دروستکراو.
(۲) [Slang]. فەنتازی؛ کەشخە؛ بە تێروتەسەلانە دروستکراو:
*( a ~ house, office, etc.)*
-plushily *(adv.)*; plushness *(n.).*
**plus sign,** نیشانەی خستنەسەر یا کۆکردنەوە (+) .
**plutocracy** (ploo-tok′rə-si), *n.* پلوتۆکراسی: (ا) ڕژێمی- سامانداران؛ فەرمانڕەوایی دەوڵەمەندان. (ب) چینی سامانداران.
**plutocrat** (ploo′tə-krat′), *n.* پلوتۆکرات: (ا) ئەندامی چینی سامانداران (ب) دەوڵەمەندێکی بەدەسەڵات؛ کەسێکی بەدەسەڵات کە دەسەڵاتەکەی لە سامانداریەوە هاتبێ. (ج) [Colloq.]، دەوڵەمەندێك.
**plutocratic** (ploo′tə-krat′ik), *adj. Also* plutocratical. -هی ڕژێم یا چینی سامانداران؛ پلوتۆکراتی.
-plutocratically *(adv.).*

**Plutonic** (ploo-ton′ik), *adj.* (۱) دۆزەخی؛ هی خودای دۆزەخ (ئەفسانەی یۆنانی). (۲) [p-]. تایبەتی بە چینەکانی ژێرەوەی زەوی؛ بە گەرمای چینەکانی ژێرەوەی زەوی دروست بووە؛ ئاگرپژێنی.
**plutonium** (ploo-tō′ni-əm), *n.* پلوتۆنیۆم: توخمێکی کیمیاییە لە دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمیدا بەکاردەهێنرێ.
**pluvial** (ploo′vi-əl), *adj. Also* pluvian, (۱) باراناوی؛ بارانی؛ تایبەتی بە باران. (۲) بە باران دروستبووە؛ لە بارانەوە پێکهاتوو (زەمینناسی).
**pluviometer** (ploo′vi-om′ə-tẽr), *n.* بارانپێو؛ پێوەری باران.
**pluviometry** (ploo′vi-om′ə-tri), *n.* زانستی باران پێوان؛ باران پێوان.
-pluviometric *(adj.)*; pluviometrical *(adj.).*
**pluvious** (ploo′vi-əs), *adj. Also* pluviose, باراناوی؛ باران زۆر لێ باریو
**ply** (plī), *v.t.* چەماندنەوە؛ نووشتاندنەوە؛ لوولدان؛ قەدکردن.
*v.i.* (۱) چەمانەوە؛ نووشتانەوە؛ قەدکران.
(۲) ملدان؛ نەرمی نواندن؛ گونجان؛ سەر بۆ نەواندن.
*n.* (۱) توێ؛ توێژاڵ؛ قەد؛ لۆ؛ لۆچ
(۲) تاڵەبەن یا دەزووی لوولدراو یا کلافەکراو لەگەڵ هی تردا.
(۳) نووشتانەوە؛ چەمانەوە؛ لوول خواردن؛ لاری.
(٤) مەیل؛ لاری؛ لایەنگری.
*adj.* توێ توێ؛ لۆلۆ؛ ئەوەندە توێی هەیە: *( three- ~ )* .
**ply** (plī), *v.t.* (۱) کردن؛ ئیشکردن؛ پێوە خەریك بوون (پیشەگەری)؛ کۆشش لەگەڵدا کردن:
*( to ~ a trade)*
(۲) بە زۆر دان بەسەردا (خواردەمەنی، خواردنەوە، دیاری)؛ بە زۆر پێدان:
*( He ~ied his guests with food and drink.)*
*( to ~ one's needle)* (۳) بەکارهێنان؛ ئیش پێکردن:
*( Boats ~ the river.)* (٤) هاتوچۆکردن؛ پێدا ڕۆیشتن:
(٥) هێرش بردنە سەر بە دەم؛ سەر کونکردن (بە پرسیار یا مشتومڕ).
*v.i.* (۱) کۆشش کردن؛ ئیشکردن؛ خەریك بوون:
*( He ~ied at the weaver's trade.)*
(۲) هاتوچۆکردن بە ڕێك وپێکی
*( The boat ~ies between the islands on a weekly schedule.)*
(۳) [Poetic]، ڕێبازێك گرتن؛ لەسەر ڕێگەیەك ڕۆیشتن
(٤) بەرەو ڕووی با کەشتی و بەلەم ڕاندن (بۆ ڕێگە گۆڕین).
**plywood** (plī′wood′), *n.* تەختەداری تەنك و پان
**p.m.,** = **post meridiem** [L.]. پاش نیوەڕۆ.
**pneuma** (noo′mə, nū′mə), *n.* (۱) گیان.
(۲) گیانی پیرۆز (خاچ پەرستی).
**pneumatic** (noo-mat′ik, nū-mat′ik), *adj.* (۱) هەوایی؛ گازی
(۲) تایبەتی بە " **pneumatics** "
(۳) بە هەوای پەستێوراو کارکردوو: *( a ~ drill)* .
(٤) پڕ لە هەوای پەستێوراو *( a ~ tire)* .
(٥) بۆشایی هەوای تێدایە (وەك ئێسقانی هەندێ باڵندە).
(٦) سینەومەمك پڕ. (۷) گیانی
*n.* (۱) تایە یا ڕەوڕەوەی پڕ لە هەوا. (۲) هۆی هاتوچۆی ڕەوڕەوەی پڕ لە هەوا
-pneumatically *(adv.).*
**pneumatics** (noo-mat′iks, nū-mat′iks), *n.pl.* زانستی هەوا (فیزیا)؛ هەواناسی؛ زانستی تایبەتی فیزیاییەکانی هەوا.
**pneumatic tire,** تایە یا چەرخی فووتێکراو
**pneumato-** (noo′mə-tō, nū′mə-tə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) هەوا؛ هەڵم. (ب) هەناسەدان (ج) گیان.
**pneumatology** (noo′mə-tol′ə-ji, nū′mə-tol′ə-ji), *n.* -(۱) ڕێبازو لێکۆڵینەوەی دیاردەی گیانی و بوونەوەری گیانی
(۲) ڕێبازو بڕوابوون بە گیانی پیرۆز (خاچ پەرستی).
**pneumatolysis** (noo′mə-tol′ə-sis, nū′mə-tol′ə-sis), *n.*

پێکهاتنی کانزا لەژێر پەستانی زۆردا.

**pneumatometer** (nōō´mə-tom′ə-têr, nū´mə-tom′ə-têr), *n.* (١) پێوەری ئەرکی سەر سىيەکان لە هەناسەداندا.
(٢) spirometer

-pneumatometry *(n.).*

**pneumatophore** (nōō′mə-tō-fôr´, nū-mat′ə-fōr´), *n.* (١) ئەندامی کونیلەداری هەناسەدان لە ڕەگی هەندێ ڕووەکی ناوچە گەرمەکاندا.
(٢) بۆشایی پڕ لە هەوا (زیندەوەرزانی).

**pneumectomy** (nū-mek′tə-mi), *n.* دەرهێنانی بەشێك لە شانەکانی سی (نەشتەرگەری).

**pneumo-** (nōō′mō, nū′mə), پێشگرێکە بەمانای: سی.

**pneumobacillus** (nōō´mō-bə-sil′əs, nū´mō-bə-sil′əs), *n.* میکرۆبی ینزو و نەخۆشی تری بۆری هەوا.

**pneumococcus** (nū´mə-kok′əs), *n.* میکرۆبی ینزو

**pneumoconiosis** (nū′mə-kon´i-ō′sis), *n.* نەخۆشییەکی سىيە دەبێتە هۆی ڕەق بوونی شانەکانی سی لە ئەنجامی هەڵمژینی بەردەوامی تەپ‌وتۆزی کانزاییەوە تووش دەبێ.

**pneumogastric** (noo´mə-gas′trik, nū´mə-gas′trik), *adj.* هی سىيەکان و گەدە.

**pneumonectomy** (nū´mə-nek′tə-mi), *n.* دەرهێنانی یەکێك لە سىيەکان (نەشتەرگەری).

**pneumonia** (nōō-mō′nyə, nū-mō′ni-ə), *n.* سووتانەوەی سی؛ پژوو؛ نەخۆشی هەوکردن و ڕەق بوون و ئاوتێزانی سىيەکان.

**pneumonic** (nōō-mon′ik, nū-mon′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە سىيەکان (٢) پژوودار؛ سی هەوکردوو؛ لە پژوو چوو.

**pneumothorax** (nōō´mō-thôr′aks, nū´mō-thō′raks), *n.* کۆبوونەوەی هەوا یا گاز لە بۆشایی پەردەی سنگ و قەفەزەی سنگدا (پزیشکەوانی)

**p.o.**, = post office, پۆستەخانە

**poach** (pōch), *v.t.* هێلکە کردنە ئاوی کوڵاوەوە و کوڵاندنی بێ تونکلەکەی *( a ~ed egg)*

**poach** (pōch), *v.t.* (١) پێشێل کردنی زەوی.
(٢) لە ئاودا گرتنەوە؛ شێلان
(٣) چوونە ناو زەوی خەڵکەوە بەدزییەوە بۆ ڕاوکردن یا ڕاوەماسی.
(٤) ڕاوکردن لە زەوی خەڵکدا بەدزییەوە
(٥) دزی کردن (بەتایبەتی ئاژەڵ و باڵندەی خەڵك دزین)؛ دزین.
*v.i.* (١) لە قوڕدا چەقین (٢) بوون بە قوڕوچڵپاو؛ بوون بە لیتە
(٣) ڕاوکردن لە زەوی خەڵکدا بەدزییەوە.

**poacher** (pō′chẽr), *n.* دزی ئاژەڵ و باڵندە؛ ڕاوکەری ئاژەڵ و باڵندە لە زەوی خەڵکدا.

**pochard** (pō′chẽrd, pō′kẽrd), *n.* جۆرە مراوییەکی سەرسوورە.

**pock** (pok), *n.* شوێن برینی ئاولە؛ کونجۆیی ئاولە.

**pocket** (pok′it), *n.* (١) گیرفان؛ باخەڵ؛ کیسە.
(٢) توورەکە؛ هەگبە؛ باشییل. (٣) بۆشایی.
(٤) سامان؛ پارە؛ گیرفان (مەجاز).
(٥) (ا) کان: بۆشایی ژێرزەمینی پڕ لە کانزا؛ کانگە (ب) کانزای خاو.
(٦) توورەکەی قوژبنی مێزی بلیارد.
(٧) (ا) تەنگ پێ هەڵچنران لە هەموو لایەکەوە لە پێشبڕکێدا.
(ب) کوێرەکۆڵان؛ کۆڵانی دەرنەچوو.
(٨) توورەکە یا بۆشایی ناولەشی گیاندار.
(٩) تەوژمێکی هەواییە کە دەبێتە هۆی لەپڕ بەربوونەوەی فڕۆکە.
(پێشی دەوترێ " air pocket ").
(١٠) شوێنێك یا کۆمەڵێکی چەپەو پارێزراو:
*( ~s of resistance, unemployment, etc.)*
*adj.* (١) دەخرێتە گیرفانەوە. (٢) بچووك.
*v.t.* (١) خستنە گیرفانەوە؛ خستنە باخەڵەوە.
(٢) ئابڵووقەدان؛ دەورەدان. (٣) دزین؛ لرف لێدان.
(٤) مل شۆڕکردن؛ سەر دانەواندن بەرامبەر هێرش یا قسەی بە تونکڵ.
(٥) شاردنەوە؛ پێشێل کردن؛ دەرنەخستن: *( ~ one's pride)* .
(٦) پووچ کردنەوە یا قەدەغەکردنی کەڵاڵەی یاسا لەلایەن سەرکۆماری ئەمەریکییەوە بە مۆرنەکردنی لەپێش پایدۆست لێکردنی کۆنگرێس

**have a person in one's pocket,** لەژێر دەستدا بوون؛ لەژێر ڕکێفدا بوون؛ جڵەوی کەسێك بەدەستەوە بوون.

**line one's pockets,** دەوڵەمەندبوون؛ گیرفانی خۆ پڕکردن.

**pocketbook** (pok′it-book´), *n.* (١) جزدان؛ کیسەی پارە.
(٢) کیسەی پارەو ووردەشتی ژنانە.
(٣) پەرتووکی بەرگ نەرمی گیرفان، واتە، بچووك.

**pocketful** (pok′it-fool´), *n.* پڕ گیرفانێك.

**pocketknife** (pok′it-nīf´), *n.* قەڵەمبڕ.

**pocket money,** وورده خەرجی؛ پارەی خەرجی؛ خەرجی.

**pocket veto,** پووچ کردنەوە یا قەدەغەکردنی کەڵاڵەی یاسایەك لەلایەن سەرکۆماری ئەمەریکاوە بە مۆرنەکردنی لەپێش پایدۆست لێکردنی کۆنگرێس

**pockmark** (pok′märk´), *n.* شوێن برینی ئاولە؛ کونجۆیی ئاولە.

-pockmarked *(adj.).*

**pocky** (pok′i), *adj.* (١) ئاولەیی؛ کونج؛ بە شوێن برینی ئاولە داپۆشراو.
(٢) فەرەنگیدار؛ ئاتەشەکدار؛ زیپکەیی؛ قنچکەیی.

**poco** (pō′kō), *adv. & n.* نەختێك؛ کەمێك؛ کەم.

**poco a poco** (pō′kō ä pō′kō), بەرەبەرە؛ ووردەووردە؛ نەختەنەختە.

**pococurante** (pō´kō-koo-ran′ti), *adj.* بێباك؛ گوێ پێ نەدەر.

**pod** (pod), *n.* (١) کەلوو (پاقلە، فاسۆلیا، نۆك... هتد)؛ تونکڵ.
(٢) قۆزاخە. (٣) تانکی بەنزین و خانەی چەك و شتی تری ژێر باڵی فڕۆکە
*v.i.* (١) قۆزاخەگرتن؛ کەلووکردن یا گرتن. (٢) ئاوسان.
*v.t.* لە کەلوو دەرهێنان؛ تونکڵ لێکردنەوە؛ پاکردن.

**pod** (pod), *n.* پۆل (باڵندە، نەهەنگ)؛ ڕەوە.
*v.t.* گردکردنەوە؛ کۆمەڵ کردن؛ مۆڵدان.

**pod** (pod), *n.* (١) قڵیشی ئامێری کونکەری وەك درەوشە.
(٢) جەڕیەند؛ ماڵی جەڕ یا ئامێری کونکەر.

**-pod** (pod), پاشگرێکە بەمانای: (ا) پێ.
(ب) ئەوەندە پێی هەیە: *( tripod)* .

**podagra** (pə-dag′rə, pod′ə-grə), *n.* باداریی پێ.

**podesta** (pō-des′tə), *n.* (١) بەڕێوەبەر یا سەرەك دادپرسی شارێکی ئیتاڵی کۆن. (٢) دادپرسی شارێکی ئیتاڵی.
(٣) سەرۆکی شارەوانی شارێکی ئیتاڵی لەکاتی فاشستەکاندا.

**podgy** (poj′i), *adj.* کورت و قەڵەو؛ کولەبنە و پڕ.

podginess *(n.).*

**podiatrist** (pō-dī′ə-trist), *n.* پزیشکی پێ.

**podiatry** (pō-dī′ə-tri), *n.* پزیشکەوانی پێ.

**podium** (pō′di-əm), *n.* (١) بنکە؛ دیواری نزمی بنکەیی.
(٢) دیواری دەوری سەکۆی نۆرانبازی لە یاریگایەکی ڕۆمانی کۆندا
(٣) دووانگە. (٤) سەکۆی قەراغ دیواری ناو ژوورێك. (٥) پێ.

**-podium** (pō′di-əm), پاشگرێکە بەمانای: پێ؛ بنکە؛ ڕاگر.

**-podous** (pə-dəs), پاشگرێکە بەمانای: ئەوەندە پێی هەیە.

**podzol** (pod′zol), *n. Also* **podsol,** خاکی سپیباو یا خۆڵەمێشی بێ پیتی ناوچە ساردەکان.

**poem** (pō′im), *n.* (١) هەڵبەست. (٢) شتێکی جوان وەك هەڵبەست.

**poesy** (pō′i-si, pō′i-zi), *n.* [Archaic], (١) **poetry** .
(٢) **poem** . (٣) درووشم. (٤) چەپکەگوڵ؛ دەستەگوڵ.

**poet** (pō′it), *n.* (١) هۆنەر؛ بوێژ؛ شاعیر.
(٢) کەسێکە کە هەستی خۆی بەجوانی و زمانپاراوی دەردەبڕێ.

**poetaster** (pō′it-as′tēr), ***n.*** هۆنەریکی گەنگ؛ بویژیکی هیچوپووچ.
**poetess** (pō′it-is), ***n.*** بویژی ژن؛ شاعیری ژن.
**poetic** (pō-et′ik), ***adj.*** (١) هۆنراوەیی؛ بویژی؛ شیعری:
***( ~ works)***
(٢) بۆ هونراوە شیاو؛ جوانو بەرز (زمان، ووتە): ***( ~ diction)*** .
(٣) لە جوانی و ڕێکوپێکیدا لە هۆنراوە دەچێ؛ قوول:
***( a ~imagination, description, etc.)***
(٤) لێهاتوو لە هۆنراوەدا.
**poetical** (pō-et′i-k'l), ***adj.*** (١) poetic .
(٢) ڕازاوە؛ نووسراو:
**poeticism** (pō-et′i-siz'm), ***n.*** ووتەیەکی هونەری زۆر بەکارهێنراوو پەڕپووت
**poetic justice,** دادی ڕەوا؛ پاداشت دانەوەی چاکەو سزادانی خراپە (وەك لە چیرۆكو داستانو شانۆنامەدا ڕوودەدات).
**poetic license,** لادانی هۆنەری؛ لادانی بویژ یا هونەرمەند لە پەیرەوی ڕێزمانی یا هونەری لەبەر پێویستیو ناچاری
**poetics** (pō-et′iks), ***n.pl.*** (١) ڕەخنەی ویژەیی؛ ڕەخنەی هۆنراوەیی.
(٢) ووتاریکە دەربارەی ڕەخنەی ویژەیی
(٣) هونەری هۆنینەوە؛ هونەری بویژی؛ هەستی شاعیری.
(٤) [P-]. ووتارێکی بەناوبانگە دەربارەی شانۆنامەی شیعری لەلایەن ئەرستۆی یونانییەوە
**poetize** (pō′it-īz′), *v.i.* هۆنینەوە؛ هۆنراوە نووسین.
***v.t.*** وەك هۆنراوە لێکردن؛ بە هەڵبەست دەربڕین.
**poet laureate,** (١) هۆنەری کۆشکی پاشا (بەتایبەتی لە ئینگلتەرە).
(٢) شاهۆنەری وڵات
**poetry** (pō′it-ri), ***n.*** (١) هونەری هۆنراوە نووسین؛ هۆنینەوە.
(٢) هۆنراوە؛ شیعر.
(٣) شتێکی هۆنراوەیی لە جوانیو ڕێکوپێکیو بەرزیو کارتێکردندا.
(٤) گیانی بویژی؛ هەستی شاعیری.
**pogonip** (pog′ə-nip), ***n.*** تەمی چڕ
**pogrom** (pō′grəm, pō-grom′), ***n.*** گەلەکوستار؛ قەلاچۆکردنی خەڵکی بێ تاوان (بەتایبەتی هی کەمایەتی نەتەوایەتی یا ئاینی بە ڕەزامەندی میری.
**pogy** (pō′gi, pog′i), ***n.*** جۆرێکە لە ماسی
**poignancy** (poin′ən-si, poin′yən-si), ***n.*** (١) تیژی (تام، بۆن).
(٢) بڕی؛ هەست بریندارکردن. (٣) توندوتیژی؛ بەتینی؛ بەهێزی.
**poignant** (poin′ənt, poin′yənt), ***adj.*** (١) تیژ (تام، بۆن)؛ توون.
(٢) بڕ؛ توندوتیژ؛ تەوس: ***( ~ satire)*** .
(٣) بەتین؛ بەهێز

**-poignantly** ***(adv.).***
**poinsettia** (poin-set′i-ə, poin-set′ə), ***n.*** ڕووەکێکی ڕازێنەرەوەیە گوڵی زەردو سوورو گەڵای سوور دەگرێ.
**point** (point), ***n.*** (١) خاڵ (نووسین، چاپەمەنی)؛ نوختە.
(٢) پەڵە؛ لەکە. (٣) (ا) شوێنی یاریکەر لە یاریگادا. (ب) یاریکەر.
(٤) [British]، شوێنی وەستانی پۆلیس بۆ پاسەوانی.
(٥) کاتێکی تایبەتی؛ کات:
***( At this ~ she left the room.; the ~ of death)***
(٦) پلە: ***( boiling ~ )*** .
(٧) بەند؛ بەش؛ نوختە: ***( He explained the problem ~ by ~.)*** .
(٨) (ا) نیشانە؛ تایبەخۆ (ب) نیشانە یا تایبەخۆی گیاندارێك (بۆ بڕیاردانی ڕەسەنی (٩) پێوانە؛ کێشانە.
(١٠) نووك (١١) شتێکی نووك تیژ.
(١٢) (ا) سەرە دەرزی؛ نووکە دەرزی. (ب) نەقشکاری.
(١٣) (ا) لووتکە؛ پۆپە (ب) لووتکەی قەدپاڵێکی درێژبووەوە بۆناو دەریا.
(١٤) ئاست؛ ڕادە (١٥) سەری پێشەنگو پاشەنگی لەشکر.
(١٦) لقە شاخی ئاسکە کێوی.
(١٧) ( **the ~** )، ناوەڕۆك یا پوختەی مەسەلەی باسکراو.
(١٨) مەبەست؛ مانا؛ کەڵك: ***( What's the ~ of acting like a child?)***
(١٩) بیری سەرەکی؛ بەشی گرنگ.
(٢٠) بیرێکی سەلمێنەر؛ بیرێکی بەجێو پەسەند (بۆ پاڵپشتی کردنی هەڵوێستێك): ***( You have a ~ there!)*** .
(٢١) پێوانە (پارەبازی، بۆرسە)
(٢٢) ژمارە (قوتابخانە)؛ نمرە: ***( A grade of "A" is worth four ~s.)*** .
(٢٣) سۆکت (کارەبا).
(٢٤) (ا) یەکێك لە ٣٢ پلەی سەر قیبلەنوما.
(ب) گۆشەی نێوان دوو پلەی سەر قیبلەنوما.
(٢٥) پێوانەی تیپی چاپەمەنی.
*v.t.* (١) خاڵبەندی کردنی ڕستە ***( to ~ a sentence)*** .
(٢) تیژکردن (پێنووس)؛ دادان (٣) تین پێدان (ووتە، چیرۆك).
(٤) ( **~ out** )، پیشاندان؛ دەرخستن؛ سەرنج بۆ ڕاکێشان:
***( P~ the way.; He likes to ~ out the shortcomings of others.)***
(٥) ئاراستەکردن (چەك، پەنجە)؛ نیشان لێگرتن؛ پەنجە بۆ ڕاکێشان
(٦) پیشاندان بە وەستانو ڕووتێکردن (سەگی ڕاو)؛ ڕووتێکردن.
(٧) سەروبۆر بۆ کردن (ڕێزمان)
(٨) درزی نێوان چینە خشتی دیوار پڕکردنەوە بە قوڕوقسڵو چیمەنتۆ
*v.i.* (١) پەنجە بۆ ڕاکێشان. (٢) سەرنج بۆ ڕاکێشان؛ پیشاندان.
(٣) ڕووتێکران؛ ئاراستەکران (٤) وەستانو ڕووکردنە نێچیر (سەگی ڕاو)
(٥) [British]، گەیین (دوومەڵ).
(٦) بەرەو با ڕۆیشتن (کەشتیەوانی)؛ ڕووکردنە با.
**at the point of,** زۆر نزیکە لە ڕوودانەوە؛ خەریکە ڕووبدات.
**beside the point,** پەیوەندی نییە بە باسەکەوە
**in point,** بەجێ؛ لە جێی خۆیایەتی.
**in point of,** دەربارەی؛ لە بابەت.
**make a point of,** لەسەر سووربوون؛ پێ داگرتن
**on the point of,** خەریکە ڕووبدات؛ نزیکە لە ڕوودانەوە.
**point out,** پیشاندان؛ پەنجە بۆ ڕاکێشان؛ دەستنیشانکردن
**point up,** بە گرنگتر پیشاندان؛ بایەخ پێدان.
**stretch ( or strain ) a point,** دانە دەم؛ زیادە پێوەنان؛ گەورەکردن (باس، دەنگوباس).
**to the point,** بەجێ؛ پەیوەندی هەیە بە ناوەڕۆکی باسەکەوە:
***( Your answer is (not) to the point. )***
**point-blank** (point′blaŋk′), ***adj.*** (١) لەنزیکەوە (تەقەکردن):
***( a ~ shot)***
(٢) بێ پێچوپەنا؛ ڕاستەوڕوو ***( a ~ answer)*** .
***adv.*** (١) لەنزیکەوە (تەقەکردن)؛ ڕاستەوخۆو بە نیشان لێگرتنەوە:
***( He fired the gun ~ at the burglar.)***
(٢) بێ پێچوپەنا؛ ڕاستەوڕوو ***( She refused ~.)*** .
**pointed** (poin′tid), ***adj.*** (١) تیژ؛ نووك تیژ؛ نووکدار: ***( a ~ arch)*** .
(٢) بڕ؛ تیژ؛ ڕاستەوڕوو؛ لە جێی خۆیدایە: ***( a ~ question)***
(٣) ئاراستەی کەسێك کراو؛ گیراوەتە کەسێك: ***( a ~ comment)***
(٤) ئاشکرا؛ لەڕوو؛ زۆر دیار: ***( a ~ lack of interest)*** .
**pointer** (poin′tēr), ***n.*** (١) پیشاندەر؛ تیژکەر.
(٢) میل (کاتژمێر، تەرازوو... هتد)؛ نیشاندەر (ئامێر).
(٣) داری پیشاندەر (کە مامۆستا یا ووتاربێژ شتی پێ نیشان دەدات لەسەر نەخشە یا تەختە)
(٤) سەگێکی ڕاوی گەورەی بەڵەکی پێست سافو تووك کورتە (کە بۆنی نێچیرەکەی کرد دەوەستێو ڕووی تێ دەکات هەتا ڕاوچییەکە خۆی ئامادە دەکات بۆ تەقەکردن)
(٥) [Colloq.]، پێشنیازی بەکەڵك؛ تەمێ:
***( to give someone a few ~s)***

(٦) [P-] . (*pl.*)؛ ناوی دوو ئەستێرەیە

**pointillism** (pwan′tə-liz′m), *n.* نیگارکێشانی خاڵ خاڵ.

**point lace,** نەخشکردن؛ نەخشکاری؛ نەخشاندن

**pointless** (point′lis), *adj.* (١) کول. بێ نووك.

(٢) بێ مانا؛ بێ ئەنجام؛ بێ مەبەست؛ نابەجێ؛ کەرانە؛ بێ سوود.

-pointlessly *(adv.)*; pointlessness *(n.)*.

**point of honor,** سەربەرزیو ناوبانگو شەرەفی کەسێکی لەسەر بەندە.

**point of view,** (١) را؛ مەڵوێست. (٢) باری سەرنج. گۆشەی سەرنج

**poise** (poiz), *n.* (١) هاوسەنگی؛ هاوتایی؛ لەنگەرگرتن؛ هاوسەنگ بوون.

(٢) سەنگینی. سەلاری؛ هێمنی؛ لەسەرخۆیی؛ ژیری

(٣) رەوت؛ شێوەی هەڵسان و دانیشتن

(٤) وەستان (بەهۆی هاوسەنگییەوە)؛ نەجوولان. (٥) ڕاڕایی؛ دوودڵی

*v.t.* (١) [Rare] . لێکدانەوە؛ بیرلێکردنەوە.

(٢) [Rare] . هاوتاکردن؛ هاوسەنگ کردن

(٣) ڕاگیرکردن. لەنگەرپێگرتن

(٤) هەڵواسین؛ هەڵواسران

*v.i.* (١) هاوتابوون. هاوسەنگ بوون؛ لەنگەرگرتن

(٢) بەسەرەوە وەستان؛ بەسەرەوە ڕاگیربوون

**poised** (poizd), *adj.* (١) سەنگین (مرۆ)؛ لە خۆ دڵنیا.

(٢) یەکسان. هاوسەنگ. (٣) ئامادە (بۆ هێرش)

**poison** (poi′z'n), *n.* (١) ژەهر

(٢) شتێکی زیانبەخش و ناپەسەند و پیس

*v.t.* (١) ژەهرخواردکردن؛ ژەهرپێدان؛ بە ژەهر کوشتن؛ دەرمانخواردکردن

(٢) ژەهرپێدان. ژەهرتێکردن

(٣) (ا) پیس کردن. *( Noxious fumes ~ the air.)*

(ب) تێکدان؛ فەوتاندن؛ تێکوپێکدان:

*( Jealousy ~ed their friendship.; He ~ed the atmosphere of the meeting.)*

*adj.* ژەهراوی. ژەهرین

**poison gas,** گازی ژەهراوی. گازی ژەهرین (لە جەنگدا بەکاردێ)

**poison hemlock,** ڕووەکێکی بۆن پیسی ڕەگ ژەهراوییە

**poison ivy,** لاولاوی ژەهراوی. ڕووەکێکی ژەهراوییە گەڵاکەی وەک هی لاولاو دەچێ و دەبێتە هۆی خوروویەکی ئێجگار زۆر ئەگەر بەر پێست بکەوێ.

**poison oak,** ڕووەکێکی ژەهراوییە گەڵای سێپەرە دەگرێت و دەبێتە هۆی خوروویەکی ئێجگار زۆر ئەگەر بەر پێست بکەوێ

**poisonous** (poi′z'n-əs), *adj.* ژەهراوی. ژەهرین.

**poison sumac,** ڕووەکێکی ژەهراوییە.

**poke** (pōk), *v.t.* (١) تێوەژەندن (بە دار یا ئانیشك)

*( P~ him in the rib.)*

(٢) [Slang] . مستەکۆڵە لێدان

(٣) کون تێکردن: *( She ~d a hole in her dress.)*

(٤) تێکدان (ئاگر). (٥) ئاژنین؛ ئاژنینەوە

(٦) پیاکردن؛ دەست تێخستن؛ تێخستن

*( P~ the stake into the ground.; Don't ~ your nose into my affairs.)*

*v.i.* (١) (~ at) . تێوەژەندن. (٢) دەست تێخستن (کاروباری خەڵك)؛ خۆتێهەڵقورتان؛ دەست کێشانە ناو

(٣) (~ about; ~ around). گەڕان؛ بۆ گەڕان

(٤) (~ along). خۆ خستن بە قنگدا؛ سستی نواندن؛ خۆخلافاندن؛ کات کوشتن بە شتی هیچوپووچەوە؛ خاوەخاوکردن

*n.* (١) تێوەژەندن (بە دار یا ئانیشك). (٢) [Slang] . مستەکۆڵە

(٣) کەسێکی سست یا کات کوژ بە شتی هیچوپووچەوە؛ خۆخلافێنەر

(٤) poke bonnet . (٥) لێواری پێشەوەی تەپڵەی ژنانە.

**poke fun ( at ).** گاڵتەپێکردن؛ لاقرتێ پێکردن؛ پێ پێکەنین.

**poke** (pōk), *n.* (١) گونیە؛ هەگبە؛ جەواڵ؛ کیسە. (٢) گیرفان؛ باخەڵ.

(٣) تلۆقی ملی مەڕ.

**poke bonnet,** تەپڵەیەکی ژنانەیە لێوارێکی پانی لە پێشەوە هەیە.

**poker** (pō′kẽr), *n.* یاری پۆکەر.

**poker** (pō′kẽr), *n.* مقاش.

**poker face,** دەموچاوی هەست پیشان نەدەر (وەك هی یاریکەری پۆکەر)؛ دەموچاوی بێ هەست و ساردوسڕ.

-poker-faced *(adj.)*.

**poky, pokey** (pō′ki), *adj.* (١) سست؛ خاو؛ خۆخلافێن.

(٢) پنتی؛ ناخاوێن و کۆنە (جل وبەرگ).

(٣) تەنگەبەر؛ بچووك؛ تەسك وترووسك: *( a ~ apartment)*

*n.* [Slang], بەندیخانە.

**Polack** (pō′läk, pō′lak), *n.* (١) [Obs.] ، پۆڵەندی؛ کەسێکی پۆڵەندی.

(٢) [Slang]. کەسێکی بنەچە پۆڵەندی (لەڕووی سووکییەوە).

*adj.* [Slang], پۆڵەندی.

**polar** (pō′lẽr), *adj.* (١) هی تەوەری باکوورو باشوور.

(٢) تەوەری. (٣) جەمسەردار. (٤) ناکۆك؛ زۆر لە یەك جیاوازو نەگونجاو.

(٥) ڕابەری؛ ڕێبەری. (٦) سەرەکی؛ ناوجەرگەیی؛ زۆر گرنگ.

**polar bear,** وورچی تەوەری. وورچێکی سپی مەلەوانە لە ناوچەی تەوەری باکووردا دەژی.

**polar circle,** (١) بازنەی تەوەری باکوور.

(٢) بازنەی تەوەری باشوور.

**polarimeter** (pō′lə-rim′ə-tẽr), *n.* پێوەری جەمسەرگری.

**Polaris** (pō-lâr′is), *n.* ئەستێرەی تەوەری باکوور.

**polariscope** (pō-lar′ə-skōp′), *n.* ئامێری پیشاندان و تاقیکردنەوەی جەمسەرگری شەپۆل ڕووناکی.

**polarity** (pō-lar′ə-ti), *n.* (١) جەمسەرگری (فیزیا)؛ جەمسەرگرتن؛ جەمسەرخوازی. (٢) ناکۆکی و جەمسەرگری؛ لە جەمسەردا گردبوونەوە (لە ئەنجامی جیاوازیدا)؛ ڕاکێشران یا چوون بەرەو: *( political ~ )*

(٣) ساردیو گەرمی (ئەلەکتریك).

**polarization** (pō′lẽr-ī-zā′shən), *n.* جەمسەرگرتن؛ جەمسەرگری؛ جەمسەرخوازی.

**polarize** (pō′lẽr-īz′), *v.t.* (١) جەمسەرپێگرتن (فیزیا).

(٢) گردکردنەوە لەم پەڕو ئەوپەڕی باسێك یا ڕاو هەڵوێستێکدا؛ بەرامبەر یەکتری وەستاندن:

*( The Vietnam war ~d the American people.)*

*v.i.* (١) جەمسەرگرتن. (٢) لەم پەڕو ئەوپەڕو بەرامبەر یەکتر وەستان.

**polar lights,** شەوقی بەرەبەیانی تەوەری باکوور.

**polaroid, Polaroid** (pō′lẽr-oid′), *n.* کۆکەرەوەی شەپۆل ڕووناکی؛ فیلمێکە جەمسەر دەگرێ بە شەپۆل ڕووناکی: *( a ~ camera)*

**polder** (pōl′dẽr), *n.* زەمینی نزمی پێکهاتوو بە پڕکردنەوەی قەراغی دەریاو دەریاچە (وەك لە هۆڵەندە).

**Pole** (pōl), *n.* کەسێکی پۆڵەندی؛ پۆڵەندییەك.

**pole** (pōl), *n.* (١) تەوەر؛ دار؛ شیش؛ ستوون؛ دارئاڵا؛ ڕاگر؛ کۆڵەکە؛ دیرەك؛ میخ؛ سنگ. (٢) تەوەری گالیسکە (کە ئەرکی مژان دەبینێ).

(٣) (ا) پێوانەیەکە بریتییە لە پێنج یاردەو نیو.

(ب) پێوانەیەکە بریتییە لە پێنج یاردەو نیو دووجا.

*v.t.* (١) پاڵ پێوەنانی بەلەم بۆناو ئاو بە دار.

(٢) دار داچەقاندن بۆ ڕووەك بۆ پیاهەڵگەڕانی: *( to ~ a plant)* .

(٣) دارپیاکردن؛ تێوەژەندن.

*v.i.* (١) پاڵ پێوەنانی بەلەم بۆناو ئاو بە دار.

(٢) داری بەفرەخلیسکێ بەکارهێنان بۆ خێرایی.

**pole** (pōl), *n.* (١) جەمسەر؛ تەوەر.

(٢) تەوەری باکوورو باشوور؛ هەردووسەری زەوی.

(٣) (ا) جەمسەری موگناتیسی. (ب) جەمسەری کارەبایی؛ جەمسەری گەرم یا

سارد: جەمسەری باتری. (ج) جەمسەری شانە (زیندەوەرزانی).
(٤) یەکێك لە دوو بیر، هێز، یا هەڵوێستی نەگونجاو و ناکۆك لەگەڵ
بەرامبەرەکەیدا (٥) سەرشار: چەق
**poles apart,** ناگونجێر پێکەوە: زۆر دوور یا جیاوازن لەیەکتری؛
ناسازین پێکەوە
**poleax, poleaxe** (pōl′aks′), *n.* (١) تەوری جەنگ.
(٢) تەوری قەساب.
*v.t.* تەور لێدان؛ تەور پیادان؛ بە تەور خستن
**pole bean,** فاسۆلیا و لۆبیای بە داردا هەڵگەڕاو.
**polecat** (pōl′kat′), *n.* (١) مشکی خورمای بۆگەن.
(٢) skunk
**pole horse,** ئەسپی گالیسکە (بەتایبەتی ئەوەی کە بەتەنیشت
تەوەرەکەوەیە لە گالیسکەیەکی چەند ئەسپیدا).
**polemic** (pō-lem′ik), *n.* (١) مشتومڕ: چەندوچۆن؛ بەرپەرچدانەوە؛
هێرش بردنە سەر بیروباوەڕ یا هەڵوێستی کەسێك و پووچکردنەوەی.
(٢) هونەری مشتومڕ کردن یا چەندوچۆن کردن.
(٣) مشتومڕکەر: کەسێکی حەزکەر لە چەندوچۆن کردن؛ بەرپەرچدەرەوە.
*adj. Also* **polemical,** (١) مشتومڕی؛ چەندوچۆنی؛ تایبەتی بە مشتومڕ.
(٢) حەزکەر لە مشتومڕ؛ چەندوچۆن کەر.
**-polemically** *(adv.).*
**polemicist** (pō-lem′ə-sist), *n. Also* polemist, مشتومڕکەر؛
کەسێکی دەستباڵا لە مشتومڕ یا نووسینی ووتاری بەرپەرچدەرەوەو
پووچکەرەوەد؛
**polemics** (pō-lem′iks), *n.pl.* (١) هونەری بەرپەرچدانەوەو
پووچکردنەوە؛ هونەری مشتومڕو چەندوچۆن کردن.
(٢) ناکۆکی: ناڕێکی: ڕێ نەکەوتن؛ دەمەقاڵێ.
**polemist** (pol′ə-mist), *n.* = polemicist.
**polestar** (pōl′stär′), *n.* (١) Polaris.
(٢) بیروباوەڕی ڕێ پیشاندەر؛ بیروڕای ڕابەر.
**pole-vault** (pōl′vôlt′), *v.i.* بازدی بەرز دان بە دارەوە.
**pole vault,** بازدی بەرز دان بە دارەوە.
**police** (pə-lēs′), *n.* (١) ڕاگرتنی ئاسایشی گشتی کۆمەڵگا.
(٢) فەرمانگەی پۆلیس؛ دەزگای پۆلیس.
(٣) هێزی پۆلیس
(٤) (*pl.*) پۆلیس؛ ئەندامانی هێزی پۆلیس
(٥) (ا) ئاسایش و پاکوتەمیزی ڕاگرتنی کۆمەڵگا.
(ب) سەربازی ئاسایش و پاکوتەمیزی ڕاگری ئۆردوگا.
*v.t.* (١) پاسەوانی کردن: چاودێری کردن؛ دابینکردن: *( to ~ the streets)* .
(٢) ئاسایش و پاکوتەمیزی ڕاگرتنی ئۆردوگا.
**police court,** دادگای تاوانی بچووك.
**police dog,** سەگی پۆلیسی (بەتایبەتی توخمی سەگی ئەڵمانی):
سەگێکە یارمەتی پۆلیس دەدات لە ئیش وکارەکانیاندا.
**police force,** هێزی پۆلیس: نیرووی پۆلیس.
**policeman** (pə-lēs′mən), *n.* پۆلیس
**police reporter,** ڕۆژنامەگەری پۆلیس: دەنگوباس دەربارەی
کاروباری پۆلیس کۆدەکاتەوە
**police state,** وڵاتی پۆلیسی: وڵاتێکە کە میری هەموو جۆرە
سەربەستی‌یەکی تێدا پێشێل کردبێ و کەس نەوێرێ دەم بکاتەوە، ئەمەش
لەڕێی بەکارهێنانی پۆلیسی نهێنی‌یەوە.
**police station,** پۆلیسخانە؛ فەرمانگەی پۆلیس.
**policewoman** (pə-lēs′woom′ən), *n.* پۆلیسی ژن
**policlinic** (pol′i-klin′ik), *n. Also* polyclinic, تیمارگەی
خەستەخانە: تیمارگەیەکە کە بەشێکە لە خەستەخانەیەك ئەو نەخۆشانەی
تێدا چارەسەر دەکرێ کە لە خەستەخانەکەدا نەنووستبن.
**policy** (pol′ə-si), *n.* (١) ژیری؛ دووربینی؛ ئۆرزانی.
(٢) ڕێباز؛ شێوەی ڕەفتارکردن: *( Honesty is the best ~ .)*
(٣) ڕامیاری؛ ڕێبازی ڕامیاری: *( This country's foreign ~ )* .
**policy** (pol′ə-si), *n.* (١) بیمەنامە؛ قۆنتەراتی بیمە.
(٢) هاییەخت؛ پیانقۆ.
**policyholder** (pol′ə-si-hōl′dēr), *n.* خاوەن بیمەنامە
**polio** (pō′li-ō′), *n.* = poliomyelitis.
**poliomyelitis** (pol′i-ō-mī′ə-lī′ə-tis), *n.* ئیفلیجی منداڵ؛
گۆجی منداڵ.
**Polish** (pō′lish), *adj.* پۆڵەندی (گەل، کلتوور، زمان... هتد).
*n.* زمانی پۆڵەندی.
**polish** (pol′ish), *v.t.* (١) بۆیاخ کردن؛ بریقەپێدان؛ سافولووس کردن؛
پەرداخ کردن؛ سپیکردنەوە (مەنجەڵ). (٢) جوان و ڕێكوپێك کردن (ڕەووشت
ڕووخسار، نووسراو... هتد)؛ پوخت کردن.
(٣) باشترکردن: کەموکووڕی لابردن.
*v.i.* (١) بریقەدانەوە؛ سافولووس بوون؛ بۆیەکران.
(٢) پوخت بوون؛ جوان و ڕێكوپێك بوون.
*n.* (١) بریقە؛ بریسکە؛ سافولووسی.
(٢) جوانی و ڕێكوپێکی؛ پوختی؛ تەڕپۆشی؛ ناسکی (ڕەووشت).
(٣) بۆیە؛ بۆیاخ. (٤) بۆیەکردن؛ بۆیەکران؛ بۆیاخکاری.
polish off, [Colloq.], (١) ماشینەوە؛ تەواوکردن.
(٢) بەسەردا زاڵبوون؛ سەرنگووم کردن؛ بەزاندن.
polish up, [Colloq.], پوخت کردن؛ باشترکردن؛ چاك کردن:
*( to polish up the speech, poem, lyrics, etc.)*
**polished** (pol′isht), *adj.* (١) بریقەدار؛ بریسکەدار؛ سافولووس.
(٢) جوان و ڕێكوپێك؛ ڕەووشت جوان؛ ناسك؛ بەنەزاکەت.
(٣) بێ ئەنگ؛ بێ کەموکووڕی؛ زۆر تەواو یا باش.
**Politburo** (pə-lit′byoor′ō), *n.* لیژنەی کارگێڕی یا جێبەجێکردن
(بەتایبەتی هی حیزبی شیوعی)؛ مەکتەبی سیاسی.
**polite** (pə-līt′), *adj.* (١) بەنەزاکەت؛ ناسك؛ جوان (کردەوە)؛
ڕەووشت جوان: *( a ~ person, answer, question, etc.)*
(٢) بەرزو جوان؛ بزان؛ ڕێكوپێك؛ ناسك: *( ~ society)* .
**politely** (pə-līt′li), *adv.* بەنەزاکەتەوە؛ بەجوانی؛ بەناسکی.
**politeness** (pə-līt′nis), *n.* نەزاکەت؛ ناسکی؛ ڕەووشت جوانی.
**politesse** (pol′ə-tes′), *n.* = politeness.
**politic** (pol′ə-tik), *adj.* (١) ژیر؛ دووربین؛ زیرەك.
(٢) زۆرزان؛ زۆڵ؛ داوباز (٣) هی هەلپەرستی؛ بە زۆرزانانە کراو
(٤) [Rare]، political
*v.i.* پڕوپاگەندە کردن بۆ هەڵبژاردن.
**political** (pə-lit′i-k′l), *adj.* (١) ڕامیاری؛ سیاسی:
*( ~ parties; ~ pressure)*
(٢) قەوارەی ڕامیاریدار.
**political economy,** = economics.
**political liberty,** سەربەستی ڕامیاری.
**politically** (pə-lit′i-k′l-i), *adv.* لەڕووی ڕامیاری‌یەوە.
**political science,** زانستی ڕامیاری؛ ڕامیاریزانی.
**politician** (pol′ə-tish′ən), *n.* (١) ڕامیار؛ سیاسەتمەدار؛ سیاسی؛
مرۆڤی سیاسەتمەدار (گەلێك جار لەڕووی سووکی‌یەوە بەکاردەهێنرێ)
(٢) (ا) ئەندامی چالاکی حیزب. (ب) نوێنەری پەرلەمان یا ئەنجوومەنی
هەڵبژێراوی تری ڕامیاری. (٣) کەسێکی هەلپەرست و خۆپەرست
(٤) کەسێکی شارەزا لە کارگێڕی میریدا.
**politicize** (pə-lit′ə-sīz′), *v.i.* (١) باسی ڕامیاری کردن.
(٢) بەشداری کردن لە چالاکی ڕامیاریدا.
*v.t.* بەرگی ڕامیاری کردنەبەر؛ لە گۆشەی ڕامیاری‌یەوە باسکردن؛
خستنە قاڵبی ڕامیاری‌یەوە
**politico** (pə-lit′i-kō′), *n.* = politician.

**politico-** (pə-lit′i-kō), پێشگرێکە بەمانای: رامیاری و... سیاسی و

**politics** (pol′ə-tiks), *n.pl.* (١) زانستی رامیاری؛ رامیاریزانی؛ سیاسەت (٢) رامیاری؛ کاروباری رامیاری. (٣) [P-] سەرەدێری وتارێکە لەلایەن ئەرستۆی یۆنانییەوە. (٤) بیشەی رامیاری؛ بەشداربوون لە کاروباری رامیاریدا. (٥) بیرورا و هەڵوێستی رامیاری؛ ئەندامێتی حیزبی (٦) تەکتیب و رێی رامیاری (٧) پیلانگێری بەتایبەتی لەناو دەستەیەک یا کۆمەڵێک یا فەرمانگەیەکدا)؛ تاقمچیتی *( company ~ ; office ~ )*

**polity** (pol′ə-ti), *n.* (١) شێوەی فەرمانڕەوایی؛ شێوەی کارگێری وڵات، کلێسە، یا رێکخراوێک (٢) دەولەت؛ قەوارەی رامیاری وڵاتێک؛ میری؛ فەرمانڕەوایی.

**polka** (pōl′kə), *n.* پۆلکا سەمایەکی بۆهیمییە

*v.i.* سەمای پۆلکا کردن.

**polka dot,** (١) خاڵی قوماشی خاڵ خاڵ (٢) قوماشی خاڵ خاڵ.

**poll** (pōl), *n.* (١) تەوقەسەر سەر؛ پشتی سەر؛ تووکەسەر. (٢) کەس کەسێک (٣) دەنگ ژماردن (هەڵبژاردن) (٤) دەنگدان (٥) سەرجەمی دەنگی دراو (هەڵبژاردن) (٦) (*pl.*) شوێنی دەنگدان (٧) poll tax (٨) راپرسی؛ راوەرگرتنی نموونەیەک لە هاووڵاتییان دەربارەی مەسەلەیەک. (٩) سەرە بانەکەی چەکوش.

*v.t.* (١) برینەوە؛ کورتکردنەوە. (٢) برینەوە (مەر، بزن)؛ قژ کورتکردنەوە؛ قەڵەم کردن؛ لق وپۆپ کردن. (٣) دەنگ تۆمارکردن یا کۆکردنەوە (هەڵبژاردن) *( to ~ a city)* . (٤) دەنگ وەرگرتن؛ دەنگ بۆ درانی کەسێکی نامزەدکراو. (٥) دەنگدان (هەڵبژاردن) (٦) راپرسین؛ راوەرگرتنی نموونەیەک لە خەڵک دەربارەی مەسەلەیەک: *( They ~ed two thousand students.)*

*v.i.* دەنگدان

**pollack** (pol′ək), *n. Also* pollock, جۆرێکە لە ماسی پوونەکە ووردی کارێر دەریۆقیو

**pollard** (pol′ẽrd), *n.* (١) گیانداری بێ شاخ (٢) درەختێکە کە سەرەکەی هەموو لقەکانی هەڵپاچرابێ بۆ ئەوەی بە پڕی لقەکانی سەرهەڵبدەنەوە.

*v.t.* هەڵپاچینی سەرو هەموو لقەکانی درەختێک بۆ ئەوەی بە پڕی سەرهەڵبدەنەوە

**polled** (pōld), *adj.* (١) [Archaic] لق وپۆپ کراو؛ قەڵەم کراو؛ برراوە (مەر، بزن) (٢) بێ شاخ

**pollee** (pōl ′ē′), *n.* کەسێکی راوەرگیراو لە راپرسیدا.

**pollen** (pol′ən), *n.* هەڵاڵە

**pollex** (pol′eks), *n.* پەنجە گەورەی دەست

**pollinate** (pol′ə-nāt′), *v.t.* چاکردنی گوڵ؛ لێکدانی هەڵاڵەو نێرک؛ چاتکردنی گوڵ

**pollination** (pol′ə-nā′shən), *n.* چاکردنی گوڵ؛ لێکدانی هەڵاڵەو نێرک

**polliniferous** (pol′ə-nif′ẽr-əs), *adj.* هەڵاڵە هێنەبەر؛ هەڵاڵەهەنگر؛ هەڵاڵەگر

**pollinium** (pə-lin′i-əm), *n.* کۆمەڵە هەڵاڵە

**pollinosis, pollenosis** (pol′ə-nō′sis), *n.* = hay fever.

**polliwog, pollywog** (pol′i-wog′), *n.* = tadpole.

**pollock** (pol′ək), *n.* = pollack.

**pollster** (pōl′stẽr), *n.* راپرس؛ راوەرگری هاووڵاتییان دەربارەی مەسەلەیەک

**poll tax,** سەرانە بەتایبەتی کە مەرجێک بێ بۆ دەنگدان.

**pollute** (pə-lōōt′), *v.t.* (١) پیس کردن؛ چەپەڵ کردن؛ پیس وپۆخڵ کردن (ئاو و خاک): *( to ~ the air, water, environment, etc.)* (٢) پیس کردن (رەووشت)؛ خراپ کردن؛ تێکدان.

**pollution** (pə-lōō′shən), *n.* (١) پیس کردن؛ پیس وپۆخڵ کردن. (٢) پیس بوون (ئاو و خاک). (٣) پیسی. (٤) رەووشت پیسی؛ رەفتار خراپی.

**pollywog** (pol′i-wog′), *n.* = polliwog.

**polo** (pō′lō), *n.* (١) پۆلۆ: یارییەکە بەسەر سواری ئەسپەوە دەکرێ بە گۆرزێکی درێژو تۆپێکی دارین. (٢) water polo .

**polo coat.** پاڵتۆی تووکی ووشتر.

**poloist** (pō′lō-ist), *n.* یاریکەری یاری پۆلۆ (ووشەی پێشووتر ببینە).

**polonaise** (pol′ə-nāz′, pō′lə-nāz′), *n.* (١) جۆرە کراسێکی ژنانەیە. (٢) جۆرە سەمایەکی پۆڵەندییە. (٣) مۆسیقای ئەم سەمایە

**polonium** (pə-lō′ni-əm), *n.* پۆلۆنیۆم: کانزایەکی تیشکدەری ئەتۆمییە.

**polo shirt,** فانیلەیەکی لۆکەی قۆڵ کورتی تەنراوی پیاوانەیە قۆپچەیەک بە بەر ملەکەیەوەیە.

**poltergeist** (pōl′tẽr-gīst′), *n.* خێوێکە گوایە دەبێتە هۆی تەقەو جیرەی مێزو دەنگی سەیر سەیری تر.

**poltroon** (pol-trōōn′), *n.* کەسێکی زۆر ترسنۆک.

**poltroonery** (pol-trōōn′ẽr-i), *n.* زۆر ترسنۆکی

**poly-** (pol′i), پێشگرێکە بەمانای: (ا) زۆر؛ فرە؛ گەلێک؛ هەمە: *( polyandry)* (ب) لە رادە بەدەر؛ نێجگار زۆر: *( polyphagia)* . (ج) فرە شێوە؛ بە گەلێک شێوە یا دۆخدا تێ دەپەڕێ: *( polymorphous)*

**polyandrist** (pol′i-an′drist), *n.* ئافرەتی فرە مێرد؛ ژنی فرە مێرددار.

**polyandrous** (pol′i-an′drəs), *adj.* (١) فرە مێرددار. (٢) تایبەتی بە فرەمێرد‌داری. (٣) فرە نێرکدار (ڕووەکناسی).

**polyandry** (pol′i-an′dri, pol′i-an′dri), *n.* (١) فرە مێرد‌داری؛ فرە مێردی. (٢) فرە نێرکداری. (٣) جووت بوونی گیاندارێکی مێینە لەگەڵ چەند نێرینەیەکدا

**polyanthus** (pol′i-an′thəs), *n.* (١) گوڵە بەهارە. (٢) نێرگز.

**polychromatic** (pol′i-krō-mat′ik), *adj.* هەمەرەنگی؛ رەنگاورەنگی.

**polychrome** (pol′i-krōm′), *adj.* (١) polychromatic . (٢) بە هەمەرەنگ جوانکردن.

**polychromy** (pol′i-krō′mi), *n.* بە جوانی رەنگاورەنگ کردن (پەیکەرتاشی، خانووسازی).

**polyclinic** (pol′i-klin′ik), *n.* خەستەخانە یا تیمارگەی گشتی (کە هەموو جۆرە نەخۆشییەکی تێدا چارەسەر دەکرێ).

**polydactyl, polydactyle** (pol′i-dak′til), *adj.* فرە پەنجە. (هەروەها " polydactylous ") .

*n.* کەسێکە کە لە دە پەنجە زیاتری هەبێ.

-polydactylism *(n.).*

**polyembryony** (pol′i-em′bri-ə-ni), *n.* فرە ئاوڵەمەیی: پەیدابوونی دوو ئاوڵەمە یا زیاتر لە یەک هێلکەدا.

**polyester** (pol′i-es′tẽr), *n.* جەوییەکی کیمیاییە بۆ ئاوبڕکردن و شت پێکەوە نووساندن بەکاردێت.

**polygamist** (pə-lig′ə-mist), *n.* پیاوی فرە ژن؛ پیاوی چەند ژنە.

**polygamous** (pə-lig′ə-məs), *adj.* (١) فرە ژن؛ چەند ژنە. (٢) تایبەتی بە فرە ژنی (٣) (ا) گوڵی نێرەومێیە یا هەر نێرە یا مێیە بە هەمان ڕووەکەوەیە. (ب) گوڵی نێرەو مێیە یا هەر نێرە یا مێیە بە ڕووەکی جیاجیای هەمان تۆخمەوەیە.

**polygamy** (pə-lig′ə-mi), *n.* فرە ژنی.

**polygenesis** (pol′i-jen′ə-sis), *n.* فرە بنەچەیی؛ هەمە سەرچاوەیی؛

پەیدابوونی توخمێك لە چەند بنەچە یا ڕەگەزێکەوە.

**polygenetic** (pol´i-jə-net′ik), *adj.* فرە بنەچە؛ هەمە سەرچاوە یا ڕەگەز

**polyglot** (pol′i-glot´), *adj.* (١) فرە زمانزان؛ چەند زمانزان (٢) بە چەند زمانێك نووسراو؛ لە چەند زمانێك پێکهاتوو.

*n.* (١) کەسێکی چەند زمانزان؛ فرە زمانزان (٢) پەرتووکێکی بە چەند زمانێك نووسراو (٣) چەند زمانێکی تێکەڵوپێکەڵ بوو؛ لە چەند زمانێك پێکهاتوو.

**-polyglotism; polyglottism** *(n.).*

**polygon** (pol′i-gon´), *n.* وێنەی ئەندازەیی چەند لاو چەند گۆشە؛ فرە گۆشەو فرە لا

**-polygonal** *(adj.).*

**polygraph** (pol′i-graf´, pol′i-gräf´), *n.* (١) مەکینەی وێنە لەبەردەرهێنان (٢) ئامێری تۆمارکردنی لێدانی دڵو پەستانی خوێنو هەناسەدان لە هەمان کاتدا (٣) **lie detector** (٤) نووسەری شتی زۆرو جۆراوجۆر

**polygynous** (pə-lij′ə-nəs), *adj.* (١) چەند ژنە؛ فرە ژن (٢) فرە نێرکدار؛ چەند نێرەکێکی پێوەیە.

**polygyny** (pə-lij′ə-ni), *n.* (١) فرە ژنی؛ چەند ژنە. (٢) پەڕینی گیاندارێکی نێر لە چەند مێینەیەك.

**polyhedral** (pol´i-hē′drəl), *adj.* فرە ڕوو (ئەندازە)؛ چەند ڕوویی

**polyhedron** (pol´i-hē′drən), *n.* شێوەیەکی ئەندازی فرە ڕوو (ئەندازە)، بەتایبەتی لە شەش ڕوو زیاتر.

**polymer** (pol′i-mēr), *n.* پۆلیمەر؛ ئاوێتەیەکی کیمیاییە لە یەککگرتنی چەند گەردیلەیەکی هەمان ماددە پێکدێت؛ فرە بەش

**polymeric** (pol´i-mer′ik), *adj.* لە چەند بەشێکی چوونیەك پێکهاتوو (کیمیا)

**polymerization** (pol´i-mēr-ī-zā′shən), *n.* یەککگرتنی چەند گەردیلەیەك لە هەمان ماددە بۆ دروستکردنی ماددەیەکی تازە.

**polymerize** (pol′i-mēr-īz´), *v.t. & v.i.* یەککگرتنی چەند گەردیلەیەك لە هەمان ماددە بۆ دروستکردنی ماددەیەکی تازە.

**polymerous** (pə-lim′ēr-əs), *adj.* فرە بەش (ڕووەکناسی)؛ فرە ئەندام؛ فرە شێوە.

**polymorph** (pol′i-môrf´), *n.* (١) (أ) بوونەوەرێکی فرە شێوە. (ب) یەکێك لەم شێوانە. (٢) (أ) ماددەیەکە کە دەبێتە بلوور بە دوو شێوە یا زیاتر (کیمیاگەری، کانزاناسی). (ب) یەکێك لەم شێوانە.

**polymorphic** (pol´i-môr′fik), *adj.* فرە شێوە؛ چەند شێوە

**polymorphism** (pol´i-môr′fiz'm), *n.* فرە شێوەیی؛ چەند شێوەیی

**polymorphous** (pol´i-môr′fəs), *adj.* فرە شێوە؛ چەند شێوە؛ بە چەند شێوە یا دۆخدا تێپەڕیو

**Polynesian** (pol´ə-nē′zhən, pol´ə-nē′shən), *adj.* پۆلینیزی (گەل، کلتوور، زمان... هتد).

*n.* (١) کەسێکی پۆلینیزی (٢) زمانی پۆلینیزی.

**polynomial** (pol´i-nō′mi-əl), *adj. & n.* (١) ڕادە زۆر (جەبر) (٢) لە دوو ناو زیاتر پێکهاتوو (زیندەوەرزانی)

**polynya** (pol´i-ni′ə), *n.* ئاوی بە سەهۆڵ دەورگیراو (بەتایبەتی لە دەریای ئەوەری باکووردا)

**polyp** (pol′ip), *n.* (١) گیاندارێکی سەرەتایی گولالەیی ئاوییە وەك شیلان (٢) لووبەکە لە پەردەی لینجی لووتو میزەڵدانو کۆم دێت.

**polypetalous** (pol´i-pet′'l-əs), *adj.* پەڕەی گوڵی جیاجیا (ڕووەکناسی)

**polyphagia** (pol´i-fā′ji-ə), *n.* (١) زۆر حەز لە خواردن کردن؛ بە هیچ شتێك تێر نەخواردن؛ زۆرخۆری هەمیشە برسی بوو (٢) هەموو جۆرە خواردەمەنییەك خواردن.

**polyphagous** (pə-lif′ə-gəs), *adj.* هەموو جۆرە خواردەمەنییەك خۆر.

**polyphone** (pol′i-fōn´), *n.* تیپی فرە دەنگ (وەك تیپی " C " لە وشەی " cat " و " nice " دا).

**polyphonic** (pol´i-fon′ik), *adj.* (١) فرە دەنگ (دەنگناسی) (وشەی پێشوو ببینە). (٢) (أ) فرە ئاواز. (ب) فرە ئاواز پێ لێدراو (پیانۆ)

**polyphonous** (pə-lif′ə-nəs), *adj.* = **polyphonic.**

**polyphony** (pə-lif′ə-ni, pol′i-fō´ni), *n.* (١) چەند دەنگی؛ فرە دەنگی. (٢) فرە ئاوازی تێکەڵاو. (٣) فرە دەنگی؛ چەند دەنگ دەربڕین (دەنگزانی).

**polyphyletic** (pol´i-fi-let′ik), *adj.* فرە بنەچەیی.

**polyploid** (pol′i-ploid´), *adj.* فرە کرۆمۆسۆمی

**polypod** (pol′i-pəd), *adj. Also* **polypodous,** فرە پێ؛ هەزارپێ

**polypus** (pol′i-pəs), *n.* = **polyp.**

**polysaccharide** (pol´i-sak′ə-rīd´), *n.* شەکرە هەمەجۆرەکان.

**polysyllabic** (pol´i-si-lab′ik), *adj.* (١) فرە بڕگەیی؛ لە سێ بڕگە زیاتر پێکهاتوو *( a ~ word)*. (٢) بە وشەی فرە بڕگە ناسراوە (زمان)؛ گەلێك لە وشەکانی لە سێ بڕگەو زیاتر پێکهاتوون *( a ~ language)*.

**polysyllabical** (pol´i-si-lab′i-k'l), *adj.* = **polysyllabic.**

**polysyllable** (pol′i-sil´ə-b'l), *n.* وشەی فرە بڕگە؛ وشەی لە سێ بڕگەو زیاتر پێکهاتوو

**-polysyllabicism; polysyllabism** *(n.).*

**polytechnic** (pol´i-tek′nik), *adj.* هی فرە پیشەو زانستی؛ تایبەتی بە زانکۆ یا دانشگایەك کە هەموو جۆرە ڕشتەیەکی زانستیو پیشەیی تێدا بووترێتەوە *( a ~ college)*.

*n.* زانکۆ یا دانشگای پۆلیتێکنیکی؛ زانکۆ یا دانشگایەکە کە هەموو جۆرە ڕشتەیەکی زانستیو پیشەیی تێدا بووترێتەوە

**polytheism** (pol′i-thē-iz'm), *n.* فرە خواپەرستی؛ فرە خواناسی.

**polytheist** (pol′i-thē´ist), *n.* فرە خواپەرست؛ کەسێکی فرە خواناس

**polytheistic** (pol´i-thē-is′tik), *adj.* هی فرە خواناسی؛ تایبەتی بە فرە خواپەرستی

**polytypic** (pol′i-tip′ik), *adj.* هی چەند جۆری؛ فرە جۆری.

**polyuria** (pol´i-yoor′i-ə), *n.* دەڵەمیز.

**-polyuric** *(adj.).*

**polyvalent** (pol´i-vā′lənt, pə-liv′ə-lənt), *adj.* (١) هی چەند هاوهێزی (کیمیا) (٢) چەند دژە زیندەیی (میکرۆبناسی)؛ هی فرە میکرۆب یا دژە ژیانی

**-polyvalence** *(n.).*

**pomace** (pum′is), *n.* (١) تلپە سێوو ترێ... هتد (٢) کۆزەرو تلپەو تۆوی هاڕاو

**pomaceous** (pō-mā′shəs), *adj.* (١) سێوی. (٢) ناووکدار (سێو، هەرمێ، بەهێ)

**pomade** (pō-mād′, pə-mäd′), *n.* بۆنی سەر

*v.t.* بۆن لەسەر دان.

**pomander** (pə-man′dēr, pō′man-dēr), *n.* (١) تۆپی بۆن خۆش: بریتییە لە چەند بۆنێکی خۆش خەڵك وەك چاوەزار یا پاراستن لە نەخۆشی هەڵیان دەگرت. (٢) سندووقی ئەم تۆپە بۆن خۆشە

**pomatum** (pō-mā′təm, pō-mä′təm), *n.* **pomade.**

**pome** (pōm), *n.* میوەی گۆشتنی ناووکدار (سێو، هەرمێ، بەهێ)

**pomegranate** (pom′gran´it, pum′gran´it), *n.* هەنار.

**pomelo** (pom′ə-lō´), *n.* = **grapefruit.**

**Pomeranian** (pom´ə-rā′ni-ən), *n.* (١) کەسێکی پۆمیرانی (کە ناوچەیەکە لە پۆڵەندە) (٢) سەگی پۆمیرانی: سەگێکی بچووکی تیسك درێژی

لووت‌و گوێ قوته

*adj.* پۆمیرانی

**pomiculture** (pō′mi-kul′chẽr), *n.* میوه په‌روه‌رده‌کردن

**pomiferous** (pō-mif′ẽr-əs), *adj.* به‌ردار؛ به‌رگر؛ به‌به‌ر

**pommel** (pum′'l), *n.* (١) سه‌ری مشووه شیر
(٢) قه‌لپووزی زین؛ به‌رکۆ

*v.t.* مسته‌کوڵه لێدان؛ به مشتووه شیر لێدان

**pomology** (pō-mol′ə-ji), *n.* زانستی میوه په‌روه‌رده‌کردن

-pomological *(adj.)*; pomologist *(n.)*.

**pomp** (pomp), *n.* (١) ته‌نته‌نه؛ شکۆ؛ مه‌زنی؛ جوانی‌و نایابی؛ فه‌نتازێتی؛ ده‌بده‌به (٢) خۆبادان؛ کەش‌وفش؛ که‌شخه؛ فیز
(٣) [Obs.] pageant.

**pompadour** (pom′pə-dôr′, pom′pə-dōr′), *n.* قژداهێنانی ژن یا پیاو به‌پشتدا

**pom-pom** (pom′pom′), *n.* (١) کوله‌پرژێنێکی گه‌وره‌ی جه‌نگی جیهانی یه‌که‌مه (٢) تۆپێکی فڕۆکه‌شکێنی جه‌نگی جیهانی دووه‌مه

**pompon** (pom′pon), *n.* (١) تۆپه‌ڵه په‌ڕ یا ئاوریشمی جوانه به کلێته‌ی ژن‌و منداڵه‌وه؛ تۆپه‌ڵێکی وه‌هایه به‌پێشه‌وه‌ی کلێته‌ی سه‌ربازه‌وه.
(٢) (ا) ڕووه‌کێکی سه‌لکداره گوڵی گه‌وره‌و هه‌مه‌ڕه‌نگ ده‌گرێت.
(ب) گوڵی ئه‌م ڕووه‌که.

**pomposity** (pom-pos′ə-ti), *n.* که‌ش‌وفش؛ خۆبادان؛ فیز؛ ته‌نته‌نه.

**pompous** (pom′pəs), *adj.* (١) به‌شکۆ؛ به‌ته‌نته‌نه؛ جوان‌و نایاب.
(٢) به‌که‌ش‌وفش؛ به‌فیز؛ که‌شخه‌چی؛ له‌خۆبایی؛ ترزل

-pomposity *(n.)*: pompously *(adv.)*; pompousness *(n.)*.

**poncho** (pon′chō), *n.* (١) به‌رگێکی ئه‌ستووری وه‌ك به‌تانیه سه‌ری پێدا ده‌کرێ‌و به‌سه‌ر شان‌و پشت‌و به‌رۆکدا شۆڕده‌بێته‌وه تا خوار ئاوقه‌د (له ئه‌مه‌ریکای باشوورو مه‌کسیك له‌به‌رده‌کرێ). (٢) مشه‌مایه‌کی بارانی وه‌ها.

**pond** (pond), *n.* ئه‌ستێل؛ گۆماو؛ چاڵاو؛ گۆله ئاو

**ponder** (pon′dẽr), *v.t.* به‌ووردی بیرلێکردنه‌وه؛ تێبینین؛ باش لێ ووردبوونه‌وه؛ هه‌ڵسه‌نگاندن

*v.i.* به‌ووردی بیرکردنه‌وه؛ تێبینین؛ باش ووردبوونه‌وه

**ponderable** (pon′dẽr-ə-b'l), *adj.* (١) ده‌کێشرێ؛ ده‌پێورێ؛ هه‌ڵده‌سه‌نگێنرێ (٢) گرنگ؛ ئه‌وتۆ؛ سه‌نگین

-ponderability *(n.)*.

**ponderosity** (pon′dẽr-os′ə-ti), *n.* (١) قورسی
(٢) قه‌به‌یی؛ زل‌و ناقۆڵایی؛ سستی (له‌به‌ر قورسی).
(٣) قورسی‌و ووشکی و ناسرووشتی (ووتار، نووسراو).

**ponderous** (pon′dẽr-əs), *adj.* (١) زۆر قورس؛ سه‌نگین
(٢) قه‌به؛ زل‌و ناقۆڵا؛ سست له‌به‌ر قورسی؛ *( ~ movement)*.
(٣) قورس‌و ووشك‌و ناسرووشتی‌و ناخۆش؛ *( ~ words; a ~ style)*.

**pond lily,** شلێری ئاو.

**pond scum,** قه‌وزه.

**pone** (pōn), *n.* نانی گه‌نمه‌شامی؛ کێکی گه‌نمه‌شامی

**pongee** (pon-jē′), *n.* قوماشی ئاوریشم به ڕه‌نگی ئاوریشمی سرووشتی.

**poniard** (pon′yẽrd), *n.* خه‌نجه‌ر

*v.t.* خه‌نجه‌ر لێدان

**pons** (ponz), *n.* (١) په‌رده ڕیشاڵی نێوان دوو به‌شی ئه‌ندامێکی له‌ش
(٢) هه‌سته ڕیشاڵی مێشك

**pons asinorum,** (١) تیۆری پێنجه‌می ئوقلیدۆس " که ده‌ڵێت دوو گۆشه به‌رامبه‌ره‌که‌ی سێگۆشه‌یه‌کی جووت لا هه‌ردووکیان یه‌کتری ئه‌ندازه).
(٢) کێشه‌یه‌کی گران بۆ ئه‌وکاران

**pontifex** (pon′tə-feks′), *n.* ئه‌ندامی ئه‌نجوومه‌نی به‌رزی قه‌شه‌کانی ڕۆمای کۆن

**pontiff** (pon′tif), *n.* (١) pontifex. (٢) سه‌رۆك قه‌شه (٣) پاپا

**pontifical** (pon-tif′i-k'l), *adj.* (١) سه‌رۆك قه‌شه‌یی؛ تایبه‌تی به سه‌رۆك قه‌شه. (٢) پاپایی. (٣) به‌شکۆ؛ به‌فیز؛ به‌که‌ش‌وفش.

*n.* (١) (*pl.*)، به‌رگ‌و کێزوگۆڵنگی سه‌رۆك قه‌شه.
(٢) په‌رتووکی ئه‌رك‌و نه‌ریته ئاینی‌یه‌کانی سه‌رشانی سه‌رۆك قه‌شه.

**pontificate** (pon-tif′i-kit), *n.* پله‌وپایه‌ی سه‌رۆك قه‌شه‌و پاپاو ماوه‌که‌ی.

*v.i.* ١) ئه‌رکی سه‌رۆك قه‌شه یا پاپا بینین.
٢) فیزلێدان؛ که‌ش‌وفش نواندن؛ قسه‌ی زل کردن.

**pontil** (pon′til), *n.* = punty.

**ponton** (pon′t'n), *n.* = pontoon.

**pontonier** (pon′tə-nêr′), *n.* ئه‌ندازیاری پردی سه‌رئاوکه‌وتوو.

**pontoon** (pon-tōōn′), *n.* ١) به‌له‌می بن ته‌خت
٢) قه‌یاغ؛ به‌له‌می بن ته‌خت یا کونگه‌ی فووتێکراوی ژێر پردی سه‌رئاوکه‌وتوو.
٣) سه‌رئاوخه‌ری فڕۆکه‌ی ئاوی (که وه‌ك به‌له‌م یا کونگه‌ی فووتێکراو وایه).

**pontoon bridge,** پردی سه‌رئاوکه‌وتووی سه‌رده‌می (که به‌سه‌ر چه‌ند به‌له‌مێك یا چه‌ند قه‌یاغێکه‌وه‌یه).
پێشی ئه‌ووترێ " ponton bridge " ).

**pony** (pō′ni), *n.* (١) ئه‌سپی کورته‌باڵا؛ ئه‌سپه بچکۆله.
٢) [Colloq.]، ئه‌سپی غارغارێن
٣) شتێکی بچووك (له‌چاو تۆخمی خۆیدا).
٤) [Colloq.]، (ا) په‌رداخێکی بچکۆله‌ی خواردنه‌وه‌ی کحولی.
ب) پڕ ئه‌م په‌رداخه بچکۆله‌یه
٥) [Colloq.]، گۆڕینێکی ده‌قاوده‌قی نووسراوێك له زمانێکی بێگانه‌وه له‌لایه‌ن قوتابی‌یه‌وه (به‌تایبه‌تی بۆ قۆپیه‌کردن).
٦) [British Slang]، بیست‌وپێنج پاوه‌نی ئینگلیزی.

*v.t. & v.i.* [Slang], ( **~ up** ), قه‌رزدانه‌وه.

**pony express,** پۆسته‌ی خێرا به ئه‌سپ.

**ponytail** (pō′ni-tāl′), *n.* *Also* pony tail, کلکه ئه‌سپی: شێوه‌یه‌که له داهێنانی قژی کچ بریتی‌یه له به‌ستنه‌وه‌ی قژ به لاستیکێك‌و خستنی به دواداو شۆڕبوونه‌وه.

**pooch** (pōōch), *n.* [Slang], سه‌گ

**poodle** (pōō′d'l), *n.* سه‌گێکی بچکۆله‌ی قژ لوول‌و پڕی ئاومانه.

**pooh** (pōō, poo, pə), *interj.* ده‌نگێکه لاقرتێ پێکردن‌و به که‌م دانان ده‌رده‌بڕێ.

**pooh-pooh** (poo′pōō′), *v.t.* لاقرتێ پێکردن؛ به هیچ‌وپووچ دانان.

**pool** (pōōl), *n.* (١) ئه‌ستێل؛ گۆماو؛ گۆلاو. (٢) چاڵاو؛ په‌نگاو.
(٣) گۆمی مه‌له؛ حه‌وزی مه‌له. (٤) شوێنی قووڵ‌و مه‌نگی ڕووبار.

**pool** (pōōl), *n.* (١) سه‌رجه‌می پاره‌ی قومار له‌سه‌ر کراوی سه‌ر مێزێك.
٢) ده‌فری ئه‌م پاره‌یه. (٣) یاری بلیارد.
٤) کردن به‌یه‌کی پاره‌ی چه‌ند که‌سێك یا کۆمپانیایه‌ك بۆ ئامانجێکی تایبه‌تی:
ا) پاره‌ی لێکدراوی چه‌ند گره‌وێك له‌سه‌ر ئه‌سپی غارغارێن
ب) سه‌رجه‌می پاره‌ی خراوه‌کاری چه‌ند که‌سێك یا کۆمپانیایه‌ك که قازانج‌و زیان به‌ش بکه‌ن. (ج) سه‌رجه‌می پاره‌ی چه‌ند پاره‌بازێك
٥) ده‌سته‌یه‌ك که‌سانی پاره کردوو به‌یه‌ك بۆ مه‌به‌ستێکی تایبه‌تی.
(٦) قۆرخ؛ ده‌سته‌ی کۆمپانیای قۆرخکار. (٧) مله‌مله‌ی شیربازی.

*v.t. & v.i.* پاره خستنه‌ناو سنووقێکی هاوبه‌شی‌یه‌وه؛ به‌شداربوون له ئه‌رکێکی هاوبه‌شیدا؛ کۆمه‌ڵێکی هه‌ره‌وه‌زی پێکهێنان:
*( to ~ our resources together)*

**poolroom** (pōōl′rōōm′, pōōl′room′), *n.* (١) ژووری بلیارد.
(٢) ژووری گره‌وکردن له‌سه‌ر ئه‌سپی غارغارێن یا یاری تر

**pool table,** مێزی بلیارد.

**poop** (pōōp), *n.* (١) به‌شی پشته‌وه‌ی که‌شتی.
(٢) به‌رزایی‌یه‌کی وه‌ك سه‌کۆی به‌شی دواوه‌ی که‌شتی بایه‌وان (که هه‌ندێ جار سه‌ربانی ژوورێکی ناو که‌شتی‌یه‌ك پێکدێنێت).

*v.t.* (١) شه‌پۆل لێدانی پشته‌وه‌ی که‌شتی.

(٢) بەرکەوتن یا لێدرانی شەپۆل لە دواوەی کەشتی.

**poop** (pōōp), *v.t.* [Slang], زۆر ماندووکردن؛ لە پەل‌وپۆ خستن؛ هێز لێ برین؛ پرووکاندن.

*v.i.* [Slang], زۆر ماندووبوون و وازهێنان؛ هێز لێ بڕان؛ پرووکان:

*( He ~ed out of the race.)*

**poop** (pōōp), *n.* [Slang], تڕ؛ تس؛ پیسایی؛ گوو.

**poop deck,** سەکۆی پشتەوەی کەشتی.

**poor** (poor), *adj.* (١) هەژار؛ بێ دەرامەت؛ نەبوو؛ ڕەش‌وڕووت؛ لات؛ دەسکورت (٢) گەند؛ قەلب؛ بێ فەڕ؛ ڕەشۆکی؛ پەڕپووت؛ خراپ.

(٣) کەم *( ~ crops)*.

(٤) بێ پیت؛ ڕووتەنی؛ بێ بەر: *( ~ soil)*.

(٥) لاواز؛ لەڕ؛ پووکاوە؛ لات: *( a ~ body)*.

(٦) ناتەواو

(٧) ناپەسەند؛ بۆگەن (ڕەووشت)؛ بەدڕەفتار: *( He is a ~ creature.)*.

(٨) ناخۆش؛ خراپ: *( We had a ~ time.)*.

(٩) کولۆل؛ داماو؛ بەسزمان؛ بەدبەخت؛ نەگبەت؛ کەساس.

**the poor,** هەژاران؛ ڕەش‌وڕووتە؛ خەڵکی بێ گوزەران.

**poor box,** سنووقی پیتاك (لە کڵێسەدا).

**poor farm,** کێڵگەی هەژاران: بۆ حەوانەوەو ئیش پێکردن و یارمەتیدانی هەژاران.

**poor house,** خانەی هەژاران؛ تەمەڵ خانە.

**poor laws,** یاساکانی یارمەتیدانی هەژاران

**poorly** (poor'li), *adv.* (١) بەخراپی؛ بەقەڵبی؛ بەناتەواوی؛ بەڕەشۆکی‌یانە (٢) بەسووکەوە (سەیرکردن): *( I think ~ of it.)*.

*adj.* [Colloq.], نەخۆش؛ ناساغ

**poor-spirited** (poor'spir'it-id), *adj.* ترسنۆك

**poor white,** کەسێکی سپی بێ دەرامەت بەتایبەت وەرزێرێکی ناوچەکانی خوارووی ئەمەریکا

**pop** (pop), *n.* (١) تەقە؛ تەقەیەکی لەپڕو بچووك.

(٢) تەقەی دەمانچەو تفەنگ (٣) خواردنەوەیەکی گازاوی.

*v.i.* (١) تەقە لێوەهاتن؛ تەقینەوە؛ تەقین

(٢) لەپڕ پەیدابوون؛ لەپڕ سەردەرهێنان: *( He ~ped into the room.)*.

(٣) ئەبلەق بوون:

*( His eyes ~ped with interest and amazement.)*

(٤) دەمانچە تەقاندن.

*v.t.* (١) تەقاندنەوە (گەنمەشامی برژاندن)؛ تەقە لێ هەڵسان.

(٢) دەمانچە تەقاندن (٣) تەقەلێکردن؛ گوللە پێوەنان.

(٤) لەپڕ خستنە ناو (سەرەتاتکێ)؛ لەپڕ لێکردن (پرسیار):

*( He ~ped his head in the room.; They ~ped a question at him.)*

(٥) بە توندی لێدان (تۆپی بێسبۆڵ)

*adv.* (١) بەتەقەوە؛ بە دەنگی تەقینەوەوە

(٢) لەپڕ؛ کوتوپڕ

**pop the question,** خوازبێنی کردن؛ داواکردن (ژنهێنان)

**pop** (pop), *n.* [Slang], باوك؛ باوە؛ بابە

**pop** (pop), *adj.* [Slang], (١) هی مۆسیقاو گۆرانی بەباو

*( a ~ singer)*

(٢) هی هونەری بەباو (بەتایبەتی نیگارکێشی)

**pop art,** هونەری بەناو (بەتایبەتی نیگارکێشی)

**popcorn** (pop'kôrn'), *n.* گەنمەشامی برژاو؛ برێشکەی گەنمەشامی

**pope** (pōp), *n.* (١) [P-] پاپا؛ سەرۆکی کڵێسەی کاسۆلیکی

(٢) کەسێکی بەشکۆو بەدەسەڵات و پلەوپایە وەك پاپا.

(٣) مەتنی کڵێسەی ئەرسەزۆکسی ڕۆژهەڵاتی.

**popedom** (pōp'dəm), *n.* پلەوپایەو دەسەڵاتی پاپا.

**popery** (pōp'ēr-i), *n.* کاسۆلیکێتی (لەڕووی ناحەزی‌یەوە)؛ بیروباوەڕو نەریتی ئاینی کاسۆلیکی.

**popeyed** (pop'īd'), *adj.* چاوزەق؛ چاودەرپۆقیو.

**popgun** (pop'gun'), *n.* تفەنگی تەپەدۆر.

**popinjay** (pop'in-jā'), *n.* (١) تووتی.

(٢) نیشانێکە بریتی‌یە لە تووتی‌یەکی پەڕۆ بەسەر دارێکەوە.

(٣) کەسێکی چەنەبازی بەفیز؛ کەسێکی لەخۆبایی زۆروێژ.

(٤) دارکونکەرەی سەوز.

**popish** (pōp'ish), *adj.* کاسۆلیکی (لەڕووی ناحەزی‌یەوە).

**poplar** (pop'lēr), *n.* (١) چنار؛ سپیدار؛ عەرعەر.

(٢) داروتەختەی چنار.

**poplin** (pop'lin), *n.* پۆپلین: جۆرە قوماشێکی کەتان، خوری، یا ئاوریشمە.

**popliteal** (pop-lit'i-əl, pop'lə-tē'əl), *adj.* هی پشتەوەی کڵاوەی ئەژنۆ.

**popper** (pop'ēr), *n.* (١) تەقە لێ هەڵساو؛ ئەوەی دەتەقێتەوە.

(٢) دەفری گەنمەشامی برژاندن.

**poppet** (pop'it), *n.* (١) poppet valve.

(٢) پارچە دارێکی بارێکە بە لاسەرووی تەنیشتی کەشتی‌یەوە بۆ ڕاگرتنی قفڵی سەوڵەکان (٣) (أ) [Obs.]، بووکەشووشە.

(ب) [British Dial.]، گیانە (بۆ منداڵ بەکاردەهێنرێ)؛ خۆشەویست.

**poppet valve,** دەمەوانە؛ تۆپەوانە.

**popple** (pop''l), *v.i.* شەپۆلدان؛ هەڵسان و بەرزبوونەوەی شەپۆلی ئاو؛ بلقدان؛ هاتنەکوڵ.

*n.* (١) ئاوی شەپۆلدار (٢) بڵقەبڵقی ئاوی کوڵاو.

**popple** (pop''l), *n.* [Colloq.], = poplar.

**poppy** (pop'i), *n.* (١) خەشخاش؛ ڕووەکی بەنگ؛ ڕووەکی تلیاك.

(٢) بەنگ؛ تلیاك (٣) سووری کاڵ.

**poppycock** (pop'i-kok'), *n.* [Colloq.], قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ.

**populace** (pop'yoo-lis), *n.* جەماوەر؛ خەڵك؛ گەل.

**popular** (pop'yoo-lēr), *adj.* (١) گشتی: *( ~ opinion)*.

(٢) لەناوجەرگەی گەلەوە هەڵقوڵاو *( ~ legend)*.

(٣) میللی؛ جەماوەری؛ نیشتمانی: *( a ~ uprising)*

(٤) باو؛ بەباو؛ بەبرەو؛ بۆ گشت کەس *( ~ music)*

(٥) هەرزان؛ بە خەڵك دەکڕێنت *( ~ prices)*

(٦) بڵاو؛ باوە لەناو خەڵکدا *( a ~ misconception)*.

(٧) بەبرەو؛ ویستراو: *( a ~ magazine, song, leader, etc.)*.

(٨) خۆشویستراو؛ خۆشەویست *( a ~ guy, girl, etc.)*.

**popular front,** بەرەی نیشتمانی

**popularity** (pop'yoo-lar'ə-ti), *n.* بەبرەوی؛ بەباوی؛ خۆشویستران لەلایەن جەماوەرەوە.

**popularize** (pop'yoo-lə-rīz'), *v.t.* برەوپێدان؛ باو پێ سەندن -popularization *(n.)*.

**popularly** (pop'yoo-lēr-li), *adv.* لەناو خەڵکدا (وا ناسراوە)؛ لەناو جەماوەردا (وای پێ دەڵێن).

**populate** (pop'yoo-lāt'), *v.t.* (١) تێدا جێنشین بوون.

(٢) ئاوەدانکردنەوە؛ خەڵك تێدا نیشتەجێکردن

**population** (pop'yoo-lā'shən), *n.* (١) دانیشتووانی وڵات یا ناوچەیەك (٢) ژمارەی دانیشتووانی وڵات یا ناوچەیەك

(٣) توخمێك یا بەشێکی تایبەتی دانیشتووانی وڵات یا ناوچەیەك *( the Japanese ~ of Hawaii)*

(٤) ئاوەدانکردنەوە؛ ئاوەدان بوونەوە.

(٥) سەرجەمی بوونەوەری ناوچەیەك (زیندەوەرزانی)

**populism** (pop'yoo-liz'm), *n.* گەل پەروەری

**populist** (pop'yoo-list), *n. & adj.* گەل پەروەر

**populous** (pop′yoo-ləs), *adj.* زۆر ئاوەدان؛ پڕ لە خەڵک؛ چڕ؛ قەرەباڵغ.

**porbeagle** (pôr′bē′g'l), *n.* جۆرێکە لە کوسە یا سەگی دەریا

**porcelain** (pôr′s'l-in, pōrs′lin), *n.* فەخفووری؛ چینی؛ کاشی.

-porcelaneous; porcellaneous *(adj.)*.

**porch** (pôrch, pōrch), *n.* (١) هەیوان؛ بەرهەیوان؛ دالان. (٢) [Obs.] ڕاڕەوی سەرگیراو.

**porcine** (pôr′sīn, pôr′sin), *adj.* بەرازی؛ لە بەراز چوو

**porcupine** (pôr′kyoo-pīn′), *n.* سووچەر

**pore** (pôr, pōr), *v.i.* (١) چاو تێ بڕین و چاو نەترووکاندن؛ ئەبلەق بوون (٢) بەووردی خوێندنەوە؛ بەووردی لێکۆڵینەوە؛ بەووردی تێروانین: *(He ~d over the book.)* (٣) بەووردی بیرلێکردنەوە: *(He ~d on the wonders of science.)*

**pore** (pôr, pōr), *n.* (١) کون؛ دەروو (٢) کونیلەی پێست؛ کونی پێست.

**porgy** (pôr′gi, pôr′ji), *n.* ماسی‌یەکی دەریایی‌یە

**poriferan** (pō-rif′ēr-ən), *n.* هەرکام لە توخمی گیاندارە هەوری‌یەکان یا ئیسفەنجی‌یەکان.

**poriferous** (pō-rif′ēr-əs), *adj.* (١) کونیلەدار؛ کون کوناوی (٢) هی گیاندارێک لە توخمی هەوری‌یەکان یا ئیسفەنجی‌یەکان

**pork** (pôrk, pōrk), *n.* (١) بەراز (٢) گۆشتی بەراز (٣) [Slang] پارە یا پلەوپایەیەکە کە لە میری‌یەوە دەست کەوتبێت بە خاتروخوایشت

**pork barrel,** [Slang]. پرۆژەی میری تەرخانکراو بۆ ناوچەیەک لەبەر خاتروخوایشت

**porker** (pôr′kēr, pōr′kēr), *n.* پەلغ؛ بەچکە بەرازی دابەستە

**porkpie** (pôrk′pī′), *n. Also* **pork pie.** (١) خەپلەی ناوتەنراو بە گۆشتی بەراز (٢) نەپلەیەکی پیاوانەی نەرمی تەوقەسەر خڕە.

**porky** (pôr′ki, pōr′ki), *adj.* (١) بەرازی؛ بەرازانە (٢) قەڵەو؛ دابەستە

**pornographic** (pôr′nə-graf′ik), *adj.* هی وێژەو وێنەو هونەری بەرەڵا و بێ ئابروو دەربارەی جووت بوون.

**pornography** (pôr-nog′rə-fi), *n.* وێژەو وێنەو هونەری بەرەڵا و بێ ئابروو دەربارەی جووت بوون؛ وێنەو نووسینی هەڵماڵراوو هەوەس هەڵسێن.

-pornographer *(n.)*.

**porosity** (pô-ros′ə-ti, pō-ros′ə-ti), *n.* (١) کونیلەداری؛ کون کوناویتی (٢) پلەی کونیلەداری شتێک. (٣) شتێکی کونیلەدار (٤) کونیلە؛ کون

**porous** (pôr′əs, pō′rəs), *adj.* کونیلەدار؛ کون کوناوی

**porphyry** (pôr′fə-ri), *n.* جۆرە بەردێکە

**porpoise** (pôr′pəs), *n.* (١) بەرازی دەریا (٢) دۆلفین

**porridge** (pôr′ij, por′ij), *n.* هەریسە؛ شۆربا

**porringer** (pôr′in-jēr, por′in-jēr), *n.* کاسەی دەسکداری شۆربا

**port** (pôrt, pōrt), *n.* (١) بەندەر (٢) شاری بەندەردار.

**port** (pôrt, pōrt), *n.* جۆرە شەرابێکی شیرینی سوورە.

**port** (pôrt, pōrt), *v.t.* (١) هەڵگرتن (٢) هەڵگرتنی تفەنگ یا شیر بەلابەلایی بۆ پشکنین

*n.* (١) شێوەی هەڵسان و دانیشتن؛ ڕەوت. (٢) شێوەی هەڵگرتنی چەک بەلابەلایی بۆ پشکنین (٣) مەبەست؛ مانا

**port** (pôrt, pōrt), *n.* لای چەپی کەشتی و فرۆکە (ئەگەر لە دواوە بوەستێت و سەیری پێشەوە بکەیت)

*adj.* لەلای چەپی کەشتی و فرۆکە.

*v.t. & v.i.* بەلای چەپدا پێچکردنەوە؛ چەرخی ئاژووتنی کەشتی بادان بەلای چەپدا

**portability** (pôr′tə-bil′ə-ti, pōr′tə-bil′ə-ti), *n.* توانای گواستنەوە یا هەڵگیران بۆ هەبوون.

**portable** (pôr′tə-b'l, pōr′tə-b'l), *adj.* (١) هەڵدەگیرێ؛ دەگوێزرێتەوە؛ هەڵگرتەنی. (٢) دەستی؛ سووک هەڵگر؛ بەئاسانی گوێزراوە. (٣) [Obs.]، بەرگەی دەگیرێ؛ لەگەڵی دەردەبرێ یا هەڵدەکرێت.

**portage** (pôr′tij, pōr′tij), *n.* (١) گواستنەوە؛ هەڵگرتن. (٢) کرێی گواستنەوە. (٣) گواستنەوەی بەلەم و ئازووقە بەسەر ڕێی وشکانیدا لە ڕووبارێکەوە بۆ ڕووبارێکی تر یا لە دەریاچەیەکەوە بۆ یەکێکی تر. (٤) ڕێگەوبانی ئەم گواستنەوەیە.

*v.t. & v.i.* گواستنەوەی بەلەم و ئازووقە لە ڕووبارێکەوە بۆ ڕووبارێکی تر یا لە دەریاچەیەکەوە بۆ دەریاچەیەکی تر.

**portal** (pôr′t'l, pōr′t'l), *n.* (١) دەرگای گەورە (بەتایبەتی هی کۆشکێک یا شوێنێکی کەشخە)؛ دەروازە. (٢) دەرگا؛ جێی چوونەژوورەوە: *( the ~ of wisdom)* . (٣) **portal vein** .

*adj.* تایبەتی بەو دەمارەی خوێن دەبات بۆ جگەر.

**portal-to-portal pay,** کرێی کرێکار لەکاتی گەیشتنیەوە بۆ کارگە هەتا کاتی ڕۆیشتنی.

**portal vein,** دەماری خوێنبەر لە سک و ڕیخۆڵە و سپڵ و زراوەوە بۆ جگەر.

**portamento** (pôr′tə-men′tō), *n.* خشان یا کشان لە ئاوازێکەوە بۆ ئاوازێکی تر.

**portance** (pôr′t'ns, pōr′t'ns), *n.* شێوەی هەڵسان و دانیشتن؛ ڕەوت.

**portative** (pôr′tə-tiv, pōr′tə-tiv), *adj.* (١) دەتوانێ هەڵبگرێ. (٢) **portable** .

**portcullis** (pôrt-kul′is, pōrt-kul′is), *n.* تەنراوێکی ئاسنە دەروازەی قەڵا و شوێنی تری وەهای پێ دەپارێزرێ.

**porte-cochere** (pôrt′kō-shâr′), *n.* (١) ڕاڕەوی بەردەمی حەوشە. (٢) ڕاڕەو یا دالانێکی سەرگیراوە لەبەردەمی خانوویەکدا بۆ ئۆتۆمبێل وەستان و دابەزینی خەڵک.

**portend** (pôr-tend′, pōr-tend′), *v.t.* ئوقڵانەلێدان؛ بۆ قڕاندن؛ نیشانەی ڕووداوێکی خراپ بوون.

**portent** (pôr′tent, pōr′tent), *n.* (١) نیشانەی شتێکی بەدووم؛ نیشانەی ڕووداوێکی خراپ لە داڕۆژدا. (٢) ڕووداوێکی نائاسایی؛ موعجیزە.

**portentous** (pôr-ten′təs, pōr-ten′təs), *adj.* (١) بەدووم؛ نیشانەی بەدوومی‌یە. (٢) بەسام؛ بەشکۆ؛ جێی سەرسامی‌یە. (٣) بەفیز؛ بەکەش‌وفش؛ تڕزل؛ لەخۆبایی.

**porter** (pôr′tēr, pōr′tēr), *n.* دەرگاوان.

**porter** (pôr′tēr, pōr′tēr), *n.* (١) کۆڵ کێش؛ کۆڵ هەڵگر؛ حەمال. (٢) فەڕاش؛ بەردەست. (٣) بەردەستی شەمەندەفەر. (٤) جۆرێکە لە بیرە.

**porterage** (pôr′tēr-ij, pōr′tēr-ij), *n.* (١) کۆڵ کێشی؛ حەمالی؛ کۆڵ هەڵگری. (٢) کرێی کۆڵ کێشان.

**porterhouse** (pôr′tēr-hous′, pōr′tēr-hous′), *n.* (١) مەیخانە (بەتایبەتی کە هەندێ جار تونێ گۆشتی برژاوی گایشی تێدا دەست دەکەوێ). (٢) تونێ گۆشتی گا.

**portfolio** (pôrt-fō′li-ō′, pōrt-fōl′yō), *n.* (١) جانتای دەست. (٢) پلەوپایەی وەزیر؛ شالیاری: *( a minister without ~ )* . (٣) لیستەی موڵک و کۆمپیالە و بەنکەنۆت و بۆرسە و سەرمایەی تری وەهای کەسێک یا بانقێک.

**porthole** (pôrt′hōl′, pōrt′hōl′), *n.* (١) کون یا کلاوڕۆشنەی لاتەنیشتی کەشتی (بۆ ڕووناکی و هەوا گۆڕین و تفەنگ لێوە تەقاندن). (٢) کونی سەنگەر (بۆ تەقە لێوەکردن). (٣) کونێکی وەها (وەک هی دەرگای فڕن)

**portico** (pôr′ti-kō′, pōr′ti-kō′), *n.* دالان؛ ڕاڕەوی سەرگیراو؛ هەیوان.

**portiere** (pôr-tyār′, pōr′ti-âr′), ***n.*** پەردەی ئەستووری دەرگا.

**portion** (pôr′shən, pōr′shən), ***n.*** (١) بەش؛ هەند؛ هەندێك

(٢) بەشە میراتی کەسێك. (٣) جیازی و پارەی بووك.

(٤) چارەنووس؛ بەخت.

(٥) بەشە خۆراکی ژەمێکی کەسێك؛ قاپە خواردەمەنی:

***( This restaurant serves large ~s.)***

***v.t.*** (١) بەش بەش کردن؛ دابەشکردن؛ بەشکردن

(٢) بۆ دانان؛ بەش پێدان. (٣) بەش بۆ بەجێهێشتن لە میراتیدا.

**portliness** (pôrt′li-nis, pōrt′li-nis), ***n.*** (١) شکۆ (٢) قەڵەوی

**portly** (pôrt′li, pōrt′li), ***adj.*** (١) بەشکۆ؛ شکۆدار. (٢) قەڵەو

**portmanteau** (pôrt-man′tō, pōrt-man′tō), ***n.*** (١) باوەڵ؛ جانتا. (٢) باوەڵی دووخانە.

**portmanteau word,** وشەیەکی دارێژراو لە پارچەی دوو وشەی تر: ( " smog " لە " smoke " و " fog " هەروەها " brunch " لە " breakfast " و " lunch " هوە).

**port of call,** بەندەری سەرلێدان؛ بەندەرێکە لەسەر ڕێگەی کەشتیدا بۆ وەستان و بار داگرتن و بارکردن و ئازووقە وەرگرتن... هتد.

**port of entry,** شوێنی چوونەناو وڵاتەوەی ڕێبوار و شتومەك پاش گومرگ کردن

**portrait** (pôr′trāt, pōr′trit), ***n.*** (١) وێنە

(٢) وێنەی کەسێك (بەتایبەتی هی دەموچاوی بەدەست کراو یا بە کامێرا گیراو) (٣) نیشانەهەڵدان؛ وەسف.

**portraitist** (pôr′trāt-ist, pōr′trāt-ist), ***n.*** وێنەگری دەموچاو؛ نیگارکێشی دەموچاو؛ وێنەگر

**portraiture** (pôr′tri-chēr, pōr′tri-chēr), ***n.*** (١) وێنەگری؛ هونەری وێنەگرتن؛ نیگارکێشی دەموچاو. (٢) **portrait** .

**portray** (pôr-trā′, pōr-trā′), ***v.t.*** (١) وێنەگرتن؛ وێنەکێشان؛ نیگارکێشان (٢) پیشاندان هەر وەك بە وێنە؛ نیشانەهەڵدان؛ وەسف کردن؛ باسکردن (٣) نواندن لەسەر شانۆ

**portrayal** (pôr-trā′əl, pōr-trā′əl), ***n.*** (١) وێنەکێشان؛ نیشانەهەڵدان؛ پیشاندان (بە وێنە یا بە وتە)؛ نواندن.

(٢) وێنە (بە دەست کراو یا نووسراو)؛ وەسف؛ باس.

**portress** (pôr′tris, pōr′tris), ***n.*** دەرگاوانی ژن.

**Portuguese** (pôr′chə-gēz′, pōr′choo-gēz′), ***adj.*** پورتوگالی (زمان، گەل، کلتوور... هتد).

***n.*** (١) پورتەگالی؛ کەسێکی پورتوگالی. (٢) زمانی پورتوگالی

**pose** (pōz), ***v.t.*** (١) لێکردن (پرسیار)؛ دانان؛ پێشنیازکردن؛ خستنە بەرچاو:

***( to ~ a question to; to ~ a problem for someone)***

(٢) وەستاندن بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ وێنەکێشان یا وێنەگرتن.

***v.i.*** (١) وەستان یا دانیشتن بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ وێنەگرتن:

***( to ~ for a picture)***

(٢) پۆزلێدان

(٣) خۆ وا پیشاندان؛ خۆ وا نواندن: ***( He ~s as a scholar.)*** .

***n.*** (١) وەستان یا هەڵوێستێکی تایبەتی بۆ وێنەگرتن یا وێنەکێشان.

(٢) پۆز؛ پۆزلێدان (٣) خۆنوواندن؛ خۆ وا پیشاندان.

**pose** (pōz), ***v.t.*** (١) [Obs.]، پرسیارکردن؛ پرسیارلێکردن.

(٢) سەرسوڕماندن یا شڵەژاندن بە پرسیاری قورس

**poser** (pōz′ēr), ***n.*** خۆنوێنەر؛ خۆ وادەرخەر؛ خۆ تەسککەرەوە؛ پۆزلێدەر

**poser** (pōz′ēr), ***n.*** پرسیاری قورس و سەر لێ شێوێنەر.

**poseur** (pō-zūr′), ***n.*** هەمیشە پۆزلێدەر؛ خۆنوێنەر؛ خۆ وا دەرخەر.

**posh** (posh), ***adj.*** [Colloq.], جوان و نایاب؛ کەشخە؛ شۆخ؛ زۆر نایاب و ڕێك‌وپێك ***( a ~ house, office, etc.)*** .

**posit** (poz′it), ***v.t.*** (١) دانان؛ جێگیرکردن؛ چەسپاندن

(٢) وا دانان.

**position** (pə-zish′ən), ***n.*** (١) دانان؛ جێگیرکردن؛ چەسپاندن

(٢) هەڵوێست؛ شێوەی وەستان یا دانان.

(٣) هەڵوێست؛ ڕا: ***( What is his ~ on abortion?)*** .

(٤) شوێنی تێدابوون؛ شوێن؛ جێ: ***( the ship's ~ )*** .

(٥) شوێنی خۆی؛ شوێنی ڕاست: ***( The players were in ~ .)***

(٦) بار (وێنە: لەم بارە، لە باری خۆیەتی... هتد):

***( his favorite ~ for making love)***

(٧) شوێنی باش یا ستراتیجی:

***( The politicians were jockeying for ~ .)***

(٨) شوێنی ستراتیجی سوپایی.

(٩) پلەوپایەی کۆمەڵایەتی

(١٠) پلەوپایەی کار؛ فرمان؛ ئیش: ***( He's got a good ~ .)*** .

***v.t.*** (١) دانان لە جێیەکی تایبەتیدا

(٢) [Rare]، دۆزینەوەی شوێنی شتێك؛ شوێن دیاریکردن.

**positive** (poz′ə-tiv), ***adj.*** (١) دەستکرد؛ مرۆڤ کرد.

(٢) ڕێك و ڕەوان؛ ڕوون؛ چەسپاو: ***( ~ instructions)*** .

(٣) خۆشبین؛ ئومێدەوار: ***( a ~ attitude; a ~ person)*** .

(٤) باش؛ بهات: ***( a ~ sign)*** .

(٥) بە بەڵێ؛ بە ئا؛ ئەرێ: ***( a ~ answer)*** .

(٦) بەرەو زۆربوون

(٧) دڵنیا؛ بێ گومان؛ پشت ئەستوور

(٨) مەبەست باش؛ بەکەڵك؛ سوودبەخش: ***( ~ criticism)*** .

(٩) بێ گومان؛ بە درۆ ناخرێتەوە؛ ڕاست: ***( ~ proof)*** .

(١٠) کردەنی

(١١) [Colloq.]، تەواو؛ بەتەواوی: ***( a ~ devil)*** .

(١٢) بوونی نەخۆشی یا میکرۆب پیشان دەدات:

***( The result of the cancer test was ~ .)***

(١٣) گەرم (کارەبا)؛ بەهێز (فیزیا)

(١٤) باری ئاسایی یا بەراوردنەکراوی ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار (ڕێزمان):

***( good, bad, beautiful, quickly, etc.)***

(١٥) (ا) تایبەتی بە ژمارەی گەورەتر لە سفر.

(ب) هی نیشانەی کۆکردنەوە ( + ) (ژمارەوپێوان).

(١٦) وێنەی شۆراوە (نەك جامەکەی).

***n.*** (١) دیاردە؛ شتی هەستپێکراو (٢) ژمارەی لە سفر گەورەتر.

(٣) گەرم (کارەبا). (٤) باری ئاوەڵناو یا ئاوەڵکرداری سادە یا بەراوورد نەکراو

(٥) وێنەی شۆراوە (نەك جامەکەی).

-positively ***(adv.)***; positiveness ***(n.)***.

**positivism** (poz′ə-tiv-iz′m), ***n.*** (١) دڵنیایی؛ بێ گومانی.

(٢) سەرسەختی؛ زۆر سووربوون لەسەر بیروڕای خۆ؛ مێشك تەسکی.

(٣) بیروڕایەکی فەلسەفیە کە دەڵێت: تەنها دیاردەی هەستپێکراو ڕاستە و جێی پشت پێ بەستنە؛ فەلسەفەی " کۆنت "

-positivist ***(n.)***; positivistic ***(adj.)***.

**positron** (poz′ə-tron′), ***n.*** پۆزیترۆن: گەردیلەی خۆگرە بارستەکەی ئەوەندەی ئەلەکترۆنە (فیزیا)

**posse** (pos′i), ***n.*** (١) دەستەیەکی چەکدارە کە سەرۆکی پۆلیسی ناوچەیەك بانگیان دەکات بۆ ئاسایش ڕاگرتن.

(٢) دەستەیەك چەکداری خاوەن دەسەڵاتی میری؛ دەستەی پاسەوان.

**in posse,** لەوانەیە؛ بۆی هەیە.

**possess** (pə-zes′), ***v.t.*** (١) خاوەن بوون؛ هەبوون؛ بوون.

(٢) هەبوون: ***( He ~es wisdom.)*** .

(٣) زانین (زمان).

(٤) دەسەڵات بەسەردا زۆربوون؛ داپێنکردن: ***( The idea ~ed him.)*** .

(٥) ڕاگرتن؛ ڕاگیرکردن؛ ئاگاداری کردن

(٦) گاین؛ جووت بوون لەگەڵ (٧) پێدان؛ کردن بە خاوەنی.

(٨) [Archaic]، دەست بەسەردا گرتن؛ دەسکەوتن؛ کردن بە هی خۆ

**possessed** (pə-zest′), *adj.* (١) هی کەسێکە؛ خاوەنی هەیە
(٢) جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە؛ شەیتان سواری کۆڵی بووە؛ سەری لێداوە؛ دێوانە؛ شێت‌وشەیدا (٣) هێمن؛ بە ووره؛ خۆڕاگر؛ خۆگر

**possessed of.** هەیەتی؛ خاوەنێتی:
*( possessed of property; possessed of a sharp tongue)*

**possession** (pə-zesh′ən), *n.* (١) خاوەن بوون؛ هەبوون؛ خاوەنێتی
(٢) شتی خاوەندار (٣) (*pl.*)، سامان؛ سەروماڵ؛ دارایی
(٤) وڵات یا ناوچەی ژێردەستە. (٥) دەست بەسەردا گرتن
(٦) هێمنی؛ خۆڕاگرتن؛ خۆگرتن؛ دان بە خۆدا گرتن
(٧) جنۆکە دەست لێ وەشان؛ دێوانەیی؛ شێت‌وشەیدایی

**possessive** (pə-zes′iv), *adj.* (١) هی خاوەنێتی؛ هی هەبوون
(٢) حەزکەر لە خاوەنێتی؛ حەزکەر لە خۆشەویستی و دڵسۆزی تەواوی کەسێک (بەتایبەتی دڵدار یا ژن و مێرد) *( a ~ person, lover, woman, etc.)*.
(٣) نیشانەی باری خاوەنێتی یا هەبوونە (ڕێزمان):
*( John's book; boys' games; my shirt; her house; its tail; It is mine.)*

*n.* (١) باری خاوەنێتی یا هەبوون (ڕێزمان). ژمارە سێ ببینە.
(٢) دارشتنێک کە ئەم بارە بگەیەنێ

**possessor** (pə-zes′ẽr), *n.* خاوەن.

**possessory** (pə-zes′ẽr-i), *adj.* (١) تایبەتی بە خاوەن؛ خاوەنێتی
(٢) خاوەن (٣) ئەنجامی خاوەنێتییە

**posset** (pos′it), *n.* خواردنەوەیەکە لە شیری گەرم و شەکر و شەراب یا بیرە پێکدێت

**possibility** (pos′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) لەوانە بوون؛ ڕێ تێ چوون؛ شیان؛ بۆ هەبوون؛ ڕەنگ بوون (٢) شتی ڕێ تێ چوو؛ شتی شیاو

**possible** (pos′ə-b'l), *adj.* (١) لەوانەیە؛ ڕێی تێ دەچێ؛ بۆی هەیە؛ ڕەنگە؛ دەشێ؛ دەگونجێ ڕووبدات (٢) لە توانادایە؛ دەتوانرێت
(٣) ڕێی پێ دەدرێت
(٤) [Colloq.]، لەگەڵی دەردەبڕێ؛ چاوپۆشی لێ دەکرێت.

**possibly** (pos′ə-bli), *adv.* (١) بە هیچ جۆرێک
*( It can't ~ work.)*
(٢) لەوانەیە؛ ڕەنگە؛ ڕێی تێ دەچێ *( It may ~ be so.)*

**possum** (pos′əm), *n.* [Colloq.], = opossum.

**play possum.** خۆ لێ گێل کردن؛ خۆ لێ کەڕکردن؛ خۆ کردن بە مردوو

**post** (pōst), *n.* (١) سنگ؛ مێخ؛ ستوون؛ کۆڵەکە؛ پایە
(٢) شوێنێکی بە سنگ دیاریکراو (وەک شوێنی دەستپێکردنی غارغارێن).

*v.t.* (١) بڵاونامە هەڵواسین (بە سنگ یا دیواردا).
(٢) جاڕدان؛ بانگ بۆ دان؛ بڵاوکردنەوە
*( to ~ a reward for capturing the murderer)*
(٣) ئاگادارکردنەوەی خەڵک بە نەچوونە ناو شوێنێکی قەدەغەوە بە هەڵواسینی بڵاونامەیەک بە سنگێکدا
(٤) ناونووسینی کەسێک لە لیستەی هەڵواسراو یا بڵاوکراوەدا
(٥) نارەزایی دەربڕین بەرامبەر بە بڵاونامە
(٦) بڵاوکردنەوەی ناوی کەشتییەکی وون بوو

**post** (pōst), *n.* (١) پاسەوانگا؛ جێی ڕاوەستانی پاسەوان یا سەرباز
(٢) لەشکرگا؛ ئۆردوگا؛ بنکەی سوپا؛ مەخفەر؛ بنکە (٣) ئۆردوو
(٤) لقی ڕێکخراوی کۆنە سەربازان (٥) کەرەنای لەشکر
(٦) جێی ئیشکردنی کەسێک لەسەر مەکینەیەک
(٧) کار؛ فرمان؛ پلەوپایەی فەرمانبەر:
*( He has served at his present ~ for three years.)*
(٨) مەڵبەندی بازرگانی؛ فرۆشگای ناوچەیەکی کەم ئاوەدانی.

*v.t.* (١) دانانی پاسەوان یا سەرباز لە شوێنی پاسەوانییەکەیدا:
*( Guards were ~ed at the door.)*
(٢) دانان بە سەرکردەی ئۆردوگا

(٣) دەستەبەری کردن؛ دانان یا پێشکەش کردن (پارەی دەستەبەری):
*( to ~ bail)*

**post** (pōst), *n.* (١) پۆستەبەر (کە لە کۆندا بە سواری ئەسپ پۆستەی دەبرد بۆ قۆناغێک و دەیدا بە سوارێکی تر وە هەروەها هەتا دەگەیەنرایە جێی خۆی) (٢) (ا) قۆناغێکی پۆستەبەری. (ب) ئەسپی پۆستە؛ ئێستگەی ئەسپی پۆستە. (٣) [Chiefly British]، (ا) پۆستە. (ب) پۆستەخانە.
(ج) سندوقی پۆستە. (د) [Dial.]، پۆستەچی. (٤) پەڕە کاغەزی گەورە

*v.i.* (١) قۆناغ بە قۆناغ ڕۆیشتن. (٢) خێرا ڕۆیشتن؛ بەپەلە بە ڕێگەدا ڕۆیشتن (وەک بە سواری ئەسپی خێرای پۆستەبەر).

*v.t.* (١) (ا) بە پۆستەدا ناردن. (ب) پەلەکردن؛ خێراکردن.
(٢) [Chiefly British]، خستنە پۆستەوە.
(٣) ئاگادارکردن؛ پێ وتن: *( He is kept well ~ed.)*.
(٤) خستنە دەفتەری ژمێریارییەوە (دەفتەرگری).

*adv.* (١) بە ئەسپی پۆستە. (٢) بە پۆستە. (٣) خێرا؛ زۆر بەخێرایی.

**post-** (pōst), پێشگرێکە بەمانای: (ا) لەدوای؛ لەپاش (کات):
*( postmortem; postgraduate)*
(ب) لەدواوە (شوێن)؛ لەپشتەوە: *( postaxial)*.

**postage** (pōs′tij), *n.* کرێی پۆستە؛ مزی پۆستە.

**postage stamp,** پووڵی پۆستە.

**postal** (pōs′t'l), *adj.* هی پۆستە؛ پۆستە.

*n.* [Colloq.], پۆستکارت.

**postal card,** پۆستکارت.

**postaxial** (pōst′ak′si-əl), *adj.* کەوتووەتە پشتی تەوەری لەشەوە.

**postbellum** (pōst′bel′əm), *adj.* دوا جەنگ (بەتایبەتی دوای شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا).

**postbox** (pōst′boks′), *n.* = mailbox.

**postboy** (pōst′boi′), *n.* (١) پۆستەبەر؛ پۆستەچی.
(٢) postilion.

**post card,** پۆستکارت.

**post chaise,** گالیسکەی چوارپێچکەیی خێرای پۆستە و ڕێبوار.

**postdate** (pōst′dāt′), *v.t.* (١) بەرواری دواتر خستنە سەر لە هی ڕوودانی ڕاستی: *( to ~ a letter, petition, check, etc.)*.
(٢) دواتر ڕوودان؛ دواتر بوون لە

**postdiluvian** (pōst′di-lōō′vi-ən), *adj.* هی دوای لافاوەکەی نووح.

*n.* مرۆڤی دوای لافاوەکەی نووح.

**poster** (pōs′tẽr), *n.* (١) بڵاونامە هەڵواسەر.
(٢) پۆستەر؛ کارتێکی گەورەیە وێنە و درووشم و نووسینی لەسەر کراوە؛ بڵاونامە بە وێنەوە.

**poster** (pōs′tẽr), *n.* (١) ڕێبواری ئەسپ و گالیسکەی پۆستە، واتە، خێرا. (٢) ئەسپی پۆستە

**posterior** (pos-tēr′i-ẽr), *n.* (١) پاشان؛ لەپاشدا؛ لەدواییدا؛ لەدوای.
(٢) پاشکۆ. (٣) هی دواوە (لەش)؛ تایبەتی بە پشتەوە.

*n.* سمت؛ قنگ؛ پاشەڵ.

**posteriority** (pos-tēr′i-ôr′ə-ti), *n.* دواتری؛ پاشکۆیی؛ پاشەڵی؛ لە دواترەوەیی

**posterity** (pos-ter′ə-ti), *n.* (١) وەجاخ؛ وەچە؛ نەوەی کەسێک.
(٢) نەوەی دواڕۆژ؛ پاشەڕۆژ؛ سەرجەمی بەرەکانی دواڕۆژ.

**postern** (pōs′tẽrn, pos′tẽrn), *n.* (١) دەرگای دواوە؛ دەرگای تایبەتی. (٢) دەرگای نهێنی قەڵایەک. (٣) شوێنی دەربازبوون یا خۆشاردنەوەی نهێنی؛ شوێنی چوونەژوورەوە یا دەرەوە بەدزییەوە.

*adj.* (١) هی دەرگای دواوە یا نهێنی. (٢) هی پشتەوە؛ هی دواوە.
(٣) کەمتر؛ پلە خوارتر. (٤) نهێنی؛ تایبەتی.

**Post Exchange,** فرۆشگای ئۆردوگا (بۆ سەرباز و ئەفسەر و فەرمانبەری ئۆردوگاکە و کەس‌وکاریان).

**postexilian** (pōst´eg-zil′i-ən, pōst´ek-sil′i-ən), *adj.* ***Also*** **postexilic,** هی سەردەمی پاش دیلێتی جوولەکە لە بابل لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا

**postfix** (pōst′fiks), *n.* = **suffix.**
*v.t.* پاشگر پێوەنان (ڕێزمان).

**postfree** (pōst′frē′), *adj.* (١) بەخۆڕایی بە پۆستەدا نێردراو؛ هی پۆستەی بەلاش (٢) [British]، مزی پۆستەکەی پێشەکی دراوە.

**postglacial** (pōst´glā′shəl), *adj.* هی دوای چەرخی سەهۆڵ.

**postgraduate** (pōst´graj′ōō-it, pōst´graj′ōō-āt′), *adj.* هی خوێندنی بەرزی دوای دەرچوون لە زانکۆ؛ هی خوێندنی دوای بەکالۆریۆس.
*n.* قوتابی دوای قۆناغی بەکالۆریۆس (کە بۆ ماستەر یا دکتۆرا دەخوێنێ).

**posthaste** (pōst′hāst´), *n.* [Archaic], پەلە.
*adv.* زۆر بەپەلە؛ زۆر بەخێرایی.

**post horse,** ئەسپی پۆستەو کرێ.

**post house,** خانی ئەسپی پۆستەو کرێ.

**posthumous** (pos′choo-məs), *adj.* (١) لەدوای مردنی باوك لەدایکبوو ***( a ~ child)*** .
(٢) لەدوای مردنی نووسەر بڵاوکراوە: ***( a ~ book)*** .
(٣) پاشەمەرگە؛ لەدوای مردن ڕووداو: ***( a ~ award)*** .

**posthumously** (pos′choo-məs-li), *adv.* بە پاشەمەرگە؛ لەدوای مردن ***( He was honored ~ .)*** .

**postiche** (pôs´tēsh′), *adj.* (١) درۆزنە (٢) زەق و ناشرین.
*n.* (١) شتی درۆزنە یا دەستکرد. (٢) بارۆکە؛ کڵاوقژ.

**postilion, postillion** (pōs-til′yən, pos-til′yən), *n.* (١) ئەو کەسەی سواری ئەسپی دەستەچەپی پێشەوە دەبێت لە گالیسکەی چوار ئەسپیدا (٢) کەسێکە سواری ئەسپی دەستەچەپ دەبێت لە گالیسکەی دوو ئەسپی بێ گالیسکەچیدا.

**postimpressionism** (pōst´im-presh′ən-iz´m), *n.* ڕێبازێکی هونەرە لە بەشی دوایی سەدەی نۆزدەهەمدا پەیدابوو بریتی بوو لە دەربڕینی هونەرمەند بۆ هەستی خۆی بەرامبەر بە شت نەك ڕاستێتی زانستی و سرووشتی ئەو شتەی کە لەو سەردەمەدا باوبوو.
-**postimpressionist** ***(n.)***; **postimpressionistic** ***(adj.)***.

**postlude** (pōst′lōōd´, pōst′lūd´), *n.* (١) ئاوازی ئۆرگانی دوای نوێژی بەکۆمەڵی کڵێسە (٢) دوا ئاواز

**postman** (pōst′mən), *n.* = **mailman.**

**postmark** (pōst′märk´), *n.* مۆری پۆستە؛ نیشانەی پۆستە
*v.t.* مۆری پۆستە لێدان.

**postmaster** (pōst′mas´tēr, pōst′mäs´tēr), *n.* (١) خانچی خانی ئەسپی پۆستە. (٢) بەڕێوەبەری پۆستەخانە.

**postmaster general,** بەڕێوەبەری گشتی پۆستە؛ وەزیری پۆستە.

**postmastership** (pōst′mas´tēr-ship´), *n.* پلەوپایەی بەڕێوەبەری پۆستەخانە.

**postmeridian** (pōst´mə-rid′i-ən), *adj.* پاش نیوەڕۆیی؛ لە پاش نیوەڕۆدا ڕووداو

**postmistress** (pōst′mis´tris), *n.* بەڕێوەبەری پۆستەخانە (ژن).

**post-mortem** (pōst´môr′təm), *adj.* (١) پاش مەرگە؛ هی پاش مردن؛ لەدوای مردن ڕووداو
(٢) تایبەتی بە تێڕوانینی لاشە (بۆ دۆزینەوەی هۆی مردن).
(٣) [Colloq.]، هی (لێکۆڵینەوەی) دوای ڕوودانی شتەکە:
***( a ~ analysis)***
*n.* (١) تێڕوانینی دوای مردن (بۆ دۆزینەوەی هۆی مردن).
(٢) [Colloq.]، پاش مەرگە؛ لێکۆڵینەوەی دوای ڕوودانی شتێك.

**postmortem examination,** تێڕوانینی پاش مردن (بۆ دۆزینەوەی هۆی مردن).

**postnatal** (pōst´nā′t'l), *adj.* دوای لەدایکبوون

**postnuptial** (pōst´nup′shəl), *adj.* دوای ژنهێنان یا شووکردن.

**post-obit** (pōst´ō′bit, pōst´ob′it), *adj.* پاش مەرگە؛ لەدوای مردن ڕووداو یا هاتەدی
*n.* قەواڵەیەکە قەرزار دەیداتە خاوەن قەرز بریتییە لە بەڵێنی بە دانەوەی قەرزەکە پاش مردنی کەسێك کە میراتی بۆ بەجێ دەهێڵێت.

**post-office** (pōst′ôf´is), *adj.* هی پۆستەخانە.

**post office,** (١) بەڕێوەبەرایەتی پۆستە (٢) پۆستەخانە.

**postoperative** (pōst´op′ə-rā′tiv), *adj.* پاش نەشتەرکاری ڕووداو.

**postorbital** (pōst-ôr′bi-t'l), *adj.* کەوتووەتە پشت چاڵایی چاوەوە.

**postpaid** (pōst′pād′), *adj.* کرێی پۆستەکەی پێشەکی دراوە.

**postpartum** (pōst´pär′təm), *adj.* پاش زایین؛ پاش منداڵبوون.

**postponable** (pōst-pōn′ə-b'l), *adj.* دوا دەخرێت؛ بۆی هەیە دوا بخرێت.

**postpone** (pōst-pōn′), *v.t.* (١) دواخستن؛ پاش خستن.
(٢) [Rare]، کەمتر بایەخ پێدان؛ بە ناگرنگ دانان؛ خستنە دوای شتی ترەوە لە بایەخ پێداندا.

**postponement** (pōst-pōn′mənt), *n.* دواخستن؛ پاش خستن

**postposition** (pōst´pə-zish′ən), *n.* (١) کردنی ووشەیەك یا پاشگرێك بە پاشکۆی ووشەیەکی تر (ڕێزمان).
(٢) ووشەی پاشکۆ (ووشەی: " for " لە " what for? " دا و " -ward " لە " homeward " دا).

**postpositive** (pōst´poz′ə-tiv), *adj.* کراو بە پاشکۆ (ڕێزمان) (ووشەی پێشوو ببینە).
*n.* ووشەی پاشکۆ.

**postprandial** (pōst´pran′di-əl), *adj.* پاش نانی ئێوارە.

**post road,** ڕێگەی پۆستە: (ا) ئەو ڕێگەیەی لە کۆندا پۆستەی لێوە دەبرا.
(ب) ئەو ڕێگەیەی خانی ئەسپی پۆستەو کرێی لەسەرە.

**postscript** (pōst′skript´, pōs′skript´), *n.* پاشکۆی نامەو ووتارو پەڕتووك؛ تێبینییەکە وەك پەراوێز دەخرێتەسەر نامەو ووتارو پەڕتووك لە کۆتاییدا.

**postulant** (pos′choo-lənt), *n.* داواکەری ئەندامێتی لە کۆمەڵێکی سۆفێتی یا خواپەرستیدا.

**postulate** (pos′choo-lāt´), *v.t.* (١) داواکردن؛ ویستن.
(٢) وادانان؛ گریمان؛ بە ڕاست دانانی شتێك بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك
*n.* (١) شتی بە ڕاست دانراو بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك؛ گریمانە.
(٢) مەرجی پێشەکی؛ پێویستی پێشەکی.
(٣) بناغە؛ بنچینە
-**postulator** ***(n.)***.

**postulation** (pos´choo-lā′shən), *n.* (١) وادانان؛ گریمان؛ بە ڕاست دانانی شتێك بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك.
(٢) گریمانە؛ شتی بە ڕاست دانراو بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك.

**posture** (pos′chēr), *n.* (١) ڕەوت؛ شێوەی هەڵسان و دانیشتن
(٢) پۆز؛ پۆزلێدان؛ هەڵوێستی نابەجێ و نازکردن و خۆفشکردنەوە.
(٣) دۆخ؛ بار: ***( the delicate ~ of foreign affairs)*** .
(٤) هەڵوێست؛ باری هەست و مێشك.
*v.t.* پۆز پێ لێدان.
*v.i.* پۆزلێدان؛ هەڵوێستێکی تایبەتی وەرگرتن (مێشك یا لەش).

**postwar** (pōst′wôr´), *adj.* پاش جەنگ

**posy** (pō′zi), *n.* (١) درووشمی هەڵکەنراو لەسەر ئەڵقە.
(٢) گوڵ؛ چەپکە گوڵ.

**pot** (pot), *n.* (١) مەنجەڵ؛ قابلەمە؛ قۆری ***( tea~ )*** .
(٢) کووپە؛ گڵێنە. (٣) **flowerpot** .
(٤) پڕ مەنجەڵێك یا قۆرییەك: ***( a ~ of tea, rice, etc.)***
(٥) شتێکی لە مەنجەڵ چوو (٦) پێك؛ جامە بادە.

(٧) [Colloq.]. (ا) پارەی قومار لەسەرکراو لە جارێکدا.
(ب) هەندێکی زۆر پارە؛ پارەیەکی زۆر
(٨) [Colloq.]. **pot shot** (٩) [Slang]. **marijuana**
*v.t.* (١) خستنە ناو مەنجەڵەوە. (٢) هەڵگرتن لە کووپەدا.
(٣) کوڵاندن لە مەنجەڵدا. (٤) ڕاوکردن بۆ گۆشت نەك بۆ خۆشی
(٥) [Colloq.]. لە نزیکەوە ڕاوکردن یا گوللە پێوەنان.
(٦) [Colloq.]. بردنەوە؛ خستنە کیسەوە؛ دەسکەوتن.
*v.i.* [Colloq.]. لە نزیکەوە ڕاوکردن یا گوللە پێوەنان.
**go to pot,** فەوتان؛ لەناوچوون؛ خراپ بوون؛ وێران بوون؛ لە کەڵك کەوتن.
**The pot calls the kettke black,** قەل بە قەل دەڵێت ڕووت ڕەش بێ.

**potable** (pō′tə-b'l), *adj.* دەخورێتەوە؛ بۆ خواردنەوە دەشێت.
*n.pl.* خواردنەوە
**potage** (pô′täzh′), *n.* [Fr.]. شۆربا.
**potassium** (pə-tas′i-əm), *n.* پۆتاسیۆم
**potassium carbonate,** کاربۆناتی پۆتاسیۆم
**potassium nitrate,** نیتراتی پۆتاسیۆم.
**potassium permanganate,** پەرمەنگەناتی پۆتاسیۆم.
**potation** (pō-tā′shən), *n.* (١) خواردنەوە (٢) پێك؛ جامە بادە
(٣) زۆر خواردنەوە (٤) خواردنەوەی کحول.
**potato** (pə-tā′tō), *n.* پەتاتە
**potato bettle ( or bug ),** قالۆنچەی پەتاتە: قالۆنچەیەکی زەردە میلی ڕەشی پێوەیە گەڵای پەتاتە دەخوات.
**potato chip,** توێی زۆر تەنکی پەتاتەی سوورکراوەی وشك.
**potbellied** (pot′bel′id), *adj.* وورگن؛ وورگ زل
**potbelly** (pot′bel′i), *n.* (١) وورگی زل؛ وورگ (٢) کەسێکی وورگن
**potboiler** (pot′boil′ẽr), *n.* بەرهەمێکی هونەری یا وێژەیی گەنگە کە هەر تەنها بۆ پارە پەیداکردن دەهێنرێتە بەرهەم
**potboy** (pot′boi′), *n.* بادەگێڕ؛ بەردەستی مەیخانە
**poteen** (pō-tēn′), *n.* ویسکی قاچاغ (لە ئێرلەندا).
**potence** (pō′t'ns), *n.* = **potency.**
**potency** (pō′t'n-si), *n.* (١) هێز؛ توانا؛ تین؛ ووزە.
(٢) توانای بەرەسەندن (٣) کەسێك یا شتێکی بەهێزو بەدەسەڵات.
(٤) کاریگەری (دەرمان)؛ بەتینی (خواردنەوەی کحول).
(٥) توانای گان کردن.
**potent** (pō′t'nt), *adj.* (١) بەهێز؛ بەدەسەڵات؛ بەزەبروزەنگ: *( a ~ monarch)*
(٢) پێ سەلمێن؛ بەهێز: *( a ~ argument, idea, etc.)*.
(٣) بەتین (دەرمان، خواردنەوە)؛ بەهێز؛ کاریگەر؛ بەکار: *( a ~ medicine, vaccine, drink, etc.)*
(٤) بەکار (گان کردن)؛ دەتوانێ گان بکات؛ گانکەر
**potentate** (pō′t'n-tāt′), *n.* پاشا؛ فەرمانڕەوا
**potential** (pə-ten′shəl), *adj.* (١) بەهێز؛ بەدەسەڵات.
(٢) بۆی هەیە؛ دەشێ؛ شاراوە (توانا)؛ لەوانەیە ببێ. *( Every admirer is a ~ enemy.)*
(٣) تایبەتی بە بارێك کە لەوانەبوون دەگەیەنێ (بە بەکارهێنانی **may, can, could**) (ڕێزمان): *( It may snow.)*
*n.* (١) توانای شاراوەو بەکارنەهێنراو (٢) لەوانەبوون؛ شیان؛ بۆ هەبوون.
(٣) ووزەی ئەلەکتریك (کە بە " ڤۆڵت " لێکدەدرێتەوە).
**potential energy,** ووزەی شاراوە یا کپ (فیزیا).
**potentiality** (pə-ten′shi-al′ə-ti), *n.* (١) لەوانەبوونی ڕوودان، پەیدابوون، یا پەرەسەندن؛ بۆ هەبوونی هاتنەدی یا هاتنەبوو.
(٢) شتێك کە توانای ئەم ڕوودانە یا هاتنەدییەی هەبێت.
**potentially** (pə-ten′shəl-i), *adv.* لەوانەیە؛ بۆی هەیە ڕووبدات؛ توانای هاتنەدی هەیە: *( a ~ dangerous situation)*
**potentilla** (pō′ten-til′ə), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکی گوڵ ڕەنگاوڕەنگن لە توخمی گوڵەباخ.
**potentiometer** (pə-ten′shi-om′ə-tẽr), *n.* ئامێری پێوانی ووزەی شاراوەی ئەلەکتریك.
**pother** (poth′ẽr), *n.* (١) دووکەڵو تەپوتۆزی چڕ.
(٢) هەراوهوریا؛ پشێوی؛ ئاشووب. (٣) جرتوفرت.
*v.t. & v.i.* پەستکردن؛ دیق پێکردن؛ تووشی مەراق کردن.
**potholder** (pot′hōl′dẽr), *n.* دەستگر؛ دەزگر.
**pothole** (pot′hōl′), *n.* (١) چاڵی ڕێگەوبانو شەقام؛ قوولکە.
(٢) چاڵێکە گێژاو هەڵی دەکەنێ لە بەردی ناو ڕووباردا.
**pothook** (pot′hook′), *n.* (١) قولاپی کتلیو مەنجەڵ پێوە هەڵواسین بەسەر ئاگرەوە (لە شێوەی تیپی " S " دا). (٢) قولاپی کتلیو مەنجەڵی گەرم لەسەر ئاگر پێ داگرتن. (٣) نیشانەیەکە وەك تیپی " S " کە منداڵ تازە فێری نووسین دەبێت دەینووسێ.
**pothouse** (pot′hous′), *n.* [British], مەیخانەی ناوبانگ خراپ.
**pothunter** (pot′hun′ter), *n.* (١) ڕاوکەرێکە کە نێچیر دەکوژێ بۆ گۆشتەکەی نەك بۆ خۆشی. (٢) یاریکەرێکە کە مەبەستی تەنها خەڵات بردنەوەیەو هیچی تر.
**potion** (pō′shən), *n.* قومە دەرمان یا ژەهر؛ خواردنەوە (بەتایبەتی ژەمە دەرمان یا ژەهر).
**potlatch** (pot′lach′), *n.* (١) (ا) [P-] ، ئاهەنگی زستانەی ناو هەندێ خێڵی هیندییە ئەمەریکاییەکان. (ب) دیاری بەیەکتر دان لە ئاهەنگێکی وەهادا.
(٢) ئاهەنگ یا جەژنی دیاری بەیەکتر دان.
**potluck** (pot′luk′), *n.* ئەو خواردنەی خوا دابێتی (دەبرێت بۆ ئاهەنگێك کە هەموو میوانێك نەختێك خواردن لەگەڵ خۆی دەهێنێ بۆ بەشداری کردنی لەگەڵ میوانەکانی تردا).
**potpie** (pot′pī′), *n.* (١) خواردەمەنییەکە بریتییە لە گۆشتی گا یا مریشكو سەوزەو نانی ئەستووری دەخرێتەسەرو لە فڕندا لێ دەنرێت.
(٢) شلەی گۆشت یا مریشك.
**potpourri** (pō′poo-rē′, pot-poor′i), *n.* (١) شلەی گۆشتو سەوزە. (٢) هەندێ گوڵی جۆراوجۆری وشك کراوەی بۆن پێوەکراوە دەخرێتە دەفرێکەوەو بۆ بۆنی خۆشی دادەنرێت.
(٣) کۆمەڵە شتی جۆراوجۆر؛ شتی هەمەجۆر؛ چێشتی مجەوەر.
**pot roast,** پارچەیەکی گەورەی گۆشتی گایە لە دەفرێکی سەرداخراودا لەناو فڕندا لێ دەنرێت.
**pot shot,** (١) گوللەی ڕاوچییەك کە هەر بۆ گۆشت ڕاودەکات نەك بۆ خۆشی. (٢) گوللەی ئاسان؛ گوللەی لە نزیکەوە تەقێنراو.
(٣) تەقەی لامسەرلایی. (٤) هەوڵی لامسەرلایی.
**potstone** (pot′stōn′), *n.* بەردی مەنجەڵ: بەردێکە دەفری چێشت لێنانی لێ درووست دەکرا لە چەرخی بەرددا.
**pottage** (pot′ij), *n.* شلەی سەوزە یا سەوزەو گۆشت؛ شۆربای خەست.
**potted** (pot′id), *adj.* (١) (ا) خراوەتە مەنجەڵەوە.
(ب) خراوەتە ئینجانەوە؛ لە گوڵداندا ڕوێنراوە: *( a ~ plant)*.
(٢) لە دیزە یا شووشەدا هەڵگیراوە.
(٣) [Slang]، سەرخۆش؛ کەیل.
**potter** (pot′ẽr), *n.* گلینەکار؛ گۆزەودیزەکەر؛ گۆزەکەر.
**potter** (pot′ẽr), *v.i. & v.t.* [Chiefly British]. خۆ خەریك کردن بە شتی هیچوپووچەوە.
**potter's field,** گۆڕستانی هەژارو بێ کەسان
**potter's wheel,** چەرخی گلینەکار؛ چەرخی گۆزەودیزەکەر
**pottery** (pot′ẽr-i), *n.* (١) کارگەی گلینە؛ کارگەی گۆزەکاری.
(٢) گلینەکاری؛ گۆزەودیزەکاری. (٣) گلینە؛ گۆزەودیزە؛ کاشی.
**pottle** (pot′'l), *n.* (١) پێوانەیەکە بریتییە لە نیو گالۆن.
(٢) دەفرێکی نیو گالۆنی. (٣) ناوەڕۆکی دەفرێکی وەها.
(٤) خواردنەوەی کحول.
**potty** (pot′i), *adj.* [British Colloq.], (١) هیچوپووچ؛ بێ بایەخ

(٢) نەختێك سەرخۆش. (٣) شێتۆکە.
**potty** (pot′i), *n.* قەعدەی منداڵ.
**pouch** (pouch), *n.* (١) توورەکە، کیسە؛ کیف؛ هەمانە.
(٢) توورەکەی باڕووت و تەقەمەنی. (٣) کیسەی تووتن.
(٤) توورەکەی پۆستە.
(٥) توورەکەی پۆستەی دبلۆماسی: *( diplomatic ~ )*.
(٦) شتێکی لە توورەکە چوو. (٧) [Scot.] گیرفان
(٨) [Archaic] جزدان (بەتایبەتی هی پارەی وورده).
(٩) کیس (تونکاری)؛ بۆشایی ناو لەش. (١٠) کەلوو.
(١١) (ا) توورەکەی ژێر سکی کەنگەر. (ب) توورەکەی ژێر دەنووکی سەقاقوش.
(١٢) چرچ و لۆچی پێستی وەك توورەکە داکەوتووی ژێر چاو.
*v.t.* (١) خستنە توورەکە یا کیسەوە؛ خستنە گیرفانەوە:
*( He ~ed all the money.)*
(٢) وەك توورەکە لێکردن.
(٣) قووتدان (باڵندە، ماسی).
*v.i.* وەك توورەکە لێهاتن؛ دەرپۆقین؛ داکەوتن.
**pouched** (poucht), *adj.* (١) توورەکەدار (وەك کەنگەر و سەقاقوش).
(٢) pouchy
**pouchy** (pouch′i), *adj.* دەلب؛ توورەکەیی
**pouf** (po͞of), *n.* (١) پرچی فشکراوە.
(٢) بەشی فش بووەوەی کراسی ژنانە. (٣) ottoman .
**poulard, poularde** (po͞o-lärd′), *n.* (١) مریشکی هێلکەدان دەرهێنراوی دابەستراو. (٢) مریشکی دابەستە.
**poult** (pōlt), *n.* بەچکە قەلەموون؛ بارۆکە؛ فەرووج.
**poulterer** (pōl′tēr-ēr), *n.* [Chiefly British]. بازرگان یا دەلالی باڵندەی ماڵی
**poultice** (pōl′tis), *n.* هەویرنەمەك (بۆ خستنەسەر برین).
*v.t.* هەویرنەمەك لێنان یا خستنەسەر.
**poultry** (pōl′tri), *n.* باڵندەی ماڵی وەك مریشك و قەل و قاز و مراوی.
**pounce** (pouns), *n.* (١) چنگی باڵندەی گۆشتخۆر.
(٢) شاڵاو (وەك هەڵۆو باڵندەی تر)؛ هێرش؛ پەلامار.
*v.i.* ( ~ on; ~ upon ), شاڵاو بۆ بردن؛ پەلاماردان؛ هێرش بردنە سەر؛ چەپۆك پیادان
**pounce** (pouns), *n.* (١) تۆزی ووشك کردنەوە (بۆ مەرەکەب بڵاونەبوونەوە و ئامادەکردنی کاغەزی لە پێستەچوو بۆ لەسەر نووسین).
(٢) تۆزی خەنووز (بۆ وێنە گواستنەوە).
*v.t.* بەکارهێنانی ئەم جۆرە تۆزە.
**pound** (pound), *n.* (١) پاوەن: سەنگ یا کێشانەیەکە بریتییە لە شانزە "ئاونس" و نەختێك کەمترە لە نیو کیلۆ.
(٢) پاوەن: پارەی ئینگلیزییە.
(٣) پاوەن: پارەی گەلێك وولاتی ترە وەك میسر، ئوستورالیا، نیوزیلەندا... هتد.
**penny wise and pound foolish,** پوول بە پوول کۆی دەکاتەوەو بەقرپ دایدەنێ.
**pound** (pound), *v.t.* (١) هاڕین؛ وورد و خاش کردن.
(٢) داگرتنەوە؛ پیاکێشان پەیتاپەیتا؛ کوتانەوە؛ مستەکۆڵە لێدان پەیتاپەیتا؛ داکوتان (بزمار، سنگ)؛ پیادان.
*( The waves were ~ing the shore.)*
*v.i.* (١) ( ~ at; ~ on )، پیاماڵین پەیتاپەیتا؛ کوتانەوە؛ لێدان؛ داگرتنەوە:
*( He was ~ing on the door.)*
(٢) بەهێواشی و تەپەتەپ ڕۆیشتن.
(٣) بەقایم لێدان (دڵ)؛ پلدان.
*n.* (١) داگرتنەوە؛ کوتانەوە؛ پیاماڵینی پەیتاپەیتا.
(٢) لێدانێکی توند؛ پیاماڵینێکی بەقایم.
(٣) تەپە؛ دەنگی پیاماڵینێکی توند.
**pound** (pound), *n.* (١) (ا) تەویلە یا پەچەی ئاژەڵی بەرەڵا و وون بوو.
(ب) کولانەی سەگ و پشیلەی بەرەڵا و وون بوو بێ خاوەن (کە شارەوانی بەرێوەی دەبات): *( a dog- ~ )*
(٢) شوێنی هەڵگرتنی شتی دەست بەسەردا گیراو (هەتا خاوەنەکەی دێت بە شوێنیدا): *( a car ~ )*
(٣) داوی گیاندار و ماسی گرتن و هێشتنەوە.
(٤) بەندیخانەی سەردەمی؛ شوێنی گلدانەوە یا ڕاگرتن.
**poundage** (poun′dij), *n.* (١) باج یا مزی سەر شتێکە بەپێی نرخەکەی بە پاوەنی ئینگلیزی لێکدەدرێتەوە. (٢) مزی شتێکە بەپێی سەنگەکەی بە پاوەن لێکدەدرێتەوە. (٣) قورسایی بە پاوەن.
**poundage** (poun′dij), *n.* (١) ڕاگرتن و هێشتنەوەی سەگ و پشیلەی بەرەڵا و وون بوو و بێ خاوەن (لە کولانەی شارەوانیدا).
(٢) (ا) کرێی دەرهێنانەوەی سەگ و پشیلە لە کولانەی وەهادا.
(ب) کرێی دەرهێنانەوەی شتومەکی دەست بەسەردا گیراو.
**poundal** (poun′d′l), *n.* پاوەندل: پێوانەیەکی هێزە (فیزیا).
**pound cake,** کێکی پاوەنی: کێکێکە لە هێلکەو پاوەنێك لە هەریەکە لە کەرەسەکانی پێکدێت وەك ئارد و شەکر و کەرە.
**pounder** (poun′dēr), *n.* شتێکە کە قورسایییەکەی ئەوەندە پاوەن بێ یا بایی ئەوەندە پاوەن بێ: *( a ten- ~ )*
**pound-foolish** (pound′fo͞ol′ish), *adj.* کەسێکە کە نەزانێ چۆن دەست بە پارەیەکی زۆرەوە بگرێ یا چارەسەری شتێکی گرنگ بکات
**pound of flesh,** داوایەکی زۆر نابەجێ و دڵڕەقانە؛ قەرزێکە کە خاوەنەکەی سوورە لەسەر سەندنەوەی هەرچۆنێك بێت.
**pound net,** تۆڕی ماسی لە چەند تۆڕێك پێکهاتوو.
**pound sterling,** پاوەنی ئینگلیزی
**pour** (pôr, pōr), *v.t.* (١) تێکردن (چا، قاوە، شلە)؛ ڕۆکردن؛ هەڵڕشتن؛ ڕشتن؛ قلپ کردنە ناو.
(٢) بەخوڕ لێوە هاتنەدەرەوە؛ زۆر ووتن؛ لافاو لێ هەڵسان (مەجان)
*( He ~ed out his tale of misfortune.; The sun ~ed down its heat.)*
*v.i.* (١) زۆر لێهاتن (دڵۆپە، شلە)؛ بەخوڕی لەبەر ڕۆیشتن؛ لێشاو لێ هەڵسان
(٢) ڕەهێڵەکردن؛ لێزمەکردن؛ بەخوڕ بارین؛ شەستەکردن.
(٣) بەسەردا داباڕین؛ بە کۆمەڵ چوونە ژوورەوە یا دەرەوە:
*( People ~ed into the hall.)*
(٤) ( ~ into )، تێڕژان (ڕووبار).
*n.* (١) لێشاو. (٢) ڕەهێڵە؛ لێزمە؛ شەستە باران؛ بارانێکی زۆر.
**pourboire** (po͞or′bwär′), *n.* [Fr.], بەخشیش.
**pourparler** (po͞or′pär′lā′), *n.* [Fr.], دەمەتەقێی پێش گفتوگۆ.
**pourpoint** (poor′point′), *n.* [Fr.], جۆرە چاکەتێکی پیاوانەی سەدانی ناوەڕاستە.
**poussette** (po͞o-set′), *n.* [Fr.], جۆرە سەمایەکی لادێیانەیە بە کۆمەڵ دەکرێ.
*v.i.* سەماکردنی وەها.
**pout** (pout), *v.i.* (١) لچ هەڵقورتان؛ لچ بەیەکدادان؛ لچ هەڵکردن.
(٢) پێش خواردنەوە؛ ڕووترش کردن؛ دەموچاو گرژکردن
(٣) دەرپۆقین (وەك لێو لەکاتی ماچ کردندا).
*v.t.* (١) دەرپۆقاندن (دەموولێو). (٢) بە لچ هەڵقورتانەوە ووتن.
*n.* (١) لچ هەڵقورتان؛ لچ بەیەکدادان؛ لچ هەڵکردن.
(٢) (*pl.*)، پێش خواردنەوە؛ دەموچاو گرژی
**pout** (pout), *n.* جۆرە ماسییەکە.
**pouter** (pout′ēr), *n.* (١) کەسێکی لچ هەڵقورتاو؛ لچ بەیەکدادەر.
(٢) کۆتری حاقوو.
**poverty** (pov′ēr-ti), *n.* (١) هەژاری؛ بێ گوزەرانی؛ بێ دەرامەتی؛ نەبوونی؛ دەستکورتی.
(٢) نەبوونی شتێکی ویستراو؛ کەمی: *( a ~ of talent)* .
(٣) کەمی؛ کزی؛ کەم و کووڕی: *( the ~ of his vocabulary)* .

(٤) بێ پیتی؛ قاتی؛ بێ بەری؛ ووشکانی: *( the ~ of the soil)* .

**poverty-stricken** (pov′ēr-ti-strik´n), *adj.* هەژار؛ لات؛ داماو؛ بێ دەرامەت؛ بێ گوزەران.

**POW; P.O.W.,** = prisoner of war. دیلی جەنگ.

**powder** (pou′dēr), *n.* (١) تۆز؛ شتی هاڕراو؛ ئارد.
(٢) پۆدرە *( bath ~ )* .
(٣) باروود

*v.t.* (١) پودرە لێدان؛ پۆدرە پێوەکردن؛ لێ هەڵپرژان. (٢) هاڕین

*v.i.* (١) هاڕران؛ هاڕین (٢) پۆدرە لە خۆ دان.

**keep one's powder dry.** وریابوون (بۆ بەرەنگاری مەترسی)؛ هەمیشە ئامادەبوون بۆ ئاکاوی

**powder blue,** شینی کاڵ

**powdered sugar,** شەکری تۆز

**powder horn,** کەڵەشاخی باروود.

**powder keg,** (١) بەرمیلی باروود
(٢) بارێکی ترسناک کە خەریک بێت بتەقێتەوە

**powder magazine,** بارووتخانە؛ عەماری باروود.

**powder monkey,** هەرزەیەکە کە بارووتی دەبرد لە بارووتخانەی کەشتی جەنگەوە بۆ تۆپەکانی.

**powder room,** ژووری تەوالێتی ژنان

**powdery** (pou′dēr-i), *adj.* (١) تۆزی؛ ئاردی؛ پۆدرەیی
(٢) بەئاسانی ووردوخاش ئەبێ؛ دەپرووێ؛ وورد دەبێ.
(٣) تەپوتۆزاوی؛ پۆدراوی

**power** (pou′ēr), *n.* (١) توانا؛ تو نێ؛ هێز.
(٢) توانایەکی تایبەتی: *( the ~ of hearing)*
(٣) تین؛ هێز؛ ووزە
(٤) (أ) دەسەڵات؛ دەسەڵاتداری؛ زۆر؛ زەبر؛ دەست ڕۆیشتن.
(ب) دەسەڵاتی بەپێی یاسا پێدراو (ج) دەسەڵاتنامە
(٥) ووزە (بەتایبەتی کارەبا)؛ هێز؛ سەرچاوەی ووزە: *( electric ~ )* .
(٦) کەسێکی بەدەسەڵات *( He is a ~ to be reckoned with.)*
(٧) وولاتێکی بەدەسەڵات: *( the big ~s)*
(٨) هێزی گەل؛ هێزی وولات (٩) خودا
(١٠) [Archaic]. هێزی چەکدار؛ سوپا؛ هێزی دەریایی.
(١١) [Colloq.]: ژمارەیەکی زۆر؛ هەندێکی زۆر
(١٢) هێز (ژمارەڕێوان، جەبر) (١٣) پلەی گەورەکردنی گەردبین.
(١٤) (pl.). حۆرێکە لە فریشتە (ئاین)

*v.t.* (١) ووزە پێدان (بۆ بزواندن)
(٢) [Colloq.]. دڕپێدان؛ بەزۆر ڕێ بۆ خۆ کردنەوە.

*adj.* (١) بە کارەبا ئیش دەکات؛ هی کارەبایی *( ~ tools)* .
(٢) بەئاسانی کارپێکراو *( ~ steering in an automobile)* .

**in power,** فەرمانڕەوایە؛ حوکمڕانی دەکات

**the powers above,** خودا؛ خوداکان

**the powers that be,** فەرمانڕەوایان؛ کاربەدەستان؛ میری

**powerboat** (pou′ēr-bōt´), *n.* = motorboat.

**power drill,** سمۆی ئەلەکتریکی؛ درەوشەی ئەلەکتریکی

**powerful** (pou′ēr-fəl), *adj.* (١) بەهێز؛ بەدەسەڵات؛ دەسەڵاتدار؛ بەتوانا (٢) بەکار (دەرمان)؛ کاریگەر. (٣) قایم؛ بەهێز؛ زل

*adv.* [Dial.], زۆر

-powerfully *(adv.)*; powerfulness *(n.)*.

**powerhouse** (pou′ēr-hous´), *n.* (١) ئێستگەی کارەبا
(٢) [Slang]. کەسێکی زۆر بەتین و بەدەسەڵات

**powerless** (pou′ēr-lis), *adj.* بێ دەسەڵات؛ بێ هێز؛ زەبوون؛ لاواز؛ دەسەڵاتی یاسایی نەدراوەتێ

**power of attorney,** بریننامە؛ وەکالەتنامە

**power plant,** ئێستگەی کارەبا

**power politics,** ڕامیاری زۆرکاری.

**powwow** (pou′wou´), *n.* (١) پزیشک و جادووگەر و پیاوی ئاینی (لەناو هیندییە ئەمەریکاییەکاندا). (٢) ئاهەنگی نزاکردن بۆ سەرکەوتن لە جەنگدا، لە نەخۆشی چاکبوونەوە، یا ڕاوی باش (لەناو هیندییە ئەمەریکاییەکاندا). (٣) کۆڕی هیندییە ئەمەریکاییەکان.
(٤) [Colloq.]، کۆڕ

*v.i.* (١) (أ) ئاهەنگ گێڕان بۆ نزاکردن.
(ب) کۆڕگرتن لەناو هیندییە ئەمەریکاییەکاندا (٢) کۆڕگرتن.

**pox** (poks), *n.* (١) نەخۆشی وەک ئاوڵە و مێکوتە. (٢) syphilis .

**pozzuolana** (pot′swə-lä′nə), *n. Also* pozzolana, پۆزۆلان: بەردێکی ئاگرپژێنییە.

**practicability** (prak´ti-kə-bil′ə-ti), *n.* کردەنیتی.

**practicable** (prak′ti-kə-b′l), *adj.* (١) کردەنی؛ دەکرێت؛ جێبەجێ دەکرێت: *( a ~ plan)* .
(٢) بەکاردێت؛ بەکەڵک؛ بەکاردەهێنرێ: *( a ~ tool)* .

-practicably *(adv.)*.

**practical** (prak′ti-k′l), *adj.* (١) تایبەتی بە کردن و چالاکی نەک خەیاڵ پلاوی و ڕەمڵ لێدان؛ کردەنی نەک خەیاڵی: *( ~ knowledge)* .
(٢) کردەنی: دەکرێت؛ جێبەجێ دەکرێت: *( ~ proposals)* .
(٣) بەکەڵک؛ بۆ بەکارهێنانە نەک بۆ جوانی: *( a ~ dress)* .
(٤) هی بەکارهێنانە (بۆ مەبەستی بەکەڵک): *( ~ science)* .
(٥) کردارخواز؛ حەز لە شت جێبەجێکردن دەکات نەک خەیاڵ لێدان؛ کردەنی؛ بەگوێرەی باری ژیان پیلانی خۆی دەگۆڕێ: *( a ~ man)*
(٦) لەڕاستیدا وایە؛ بریتییە لە.

**practicality** (prak´ti-kal′ə-ti), *n.* (١) کردەنیتی؛ کردارخوازی؛ بۆ هەبوونی جێبەجێکردنی شتێک؛ کردنخوازی نەک خەیاڵ پلاوی
(٢) شتێکی کردەنی.

**practical joke,** تەشقەڵە؛ پەنگ:
*( to play a ~ on someone)*

**practically** (prak′tik-li, prak′ti-k′l-i), *adv.* (١) بە کردەوە؛ لەڕووی کردەنێتییەوە؛ بە کردن؛ بە کردار.
(٢) لە هەموو ڕوویەکەوە؛ بە کردەوە؛ لەڕاستیدا؛ بە کردار:
*( He is ~ the boss.)*
(٣) نزیکەی.

**practice** (prak′tis), *v.t.* (١) مەشق کردن؛ خۆ پێ ڕاهێنان.
(٢) کردن (بە پیشە)؛ خەریک بوون (پیشەگەری): *( She ~s medicine.)*
(٣) مەشق پێکردن؛ فێرکردن؛ ڕاهێنان.
(٤) پەیڕەوی کردن *( to ~ one's religion)* .
(٥) [Obs.]، پیلان گێڕان

*v.i.* (١) مەشق کردن؛ ڕاهێنان؛ خۆ ڕاهێنان. (٢) کردن (پیشەگەری)
(٣) [Obs.]، پیلان گێڕان.

*n.* (١) (أ) خوو: *( He makes a ~ of coming to work early.)* .
(ب) نەریت: *( Tipping is the ~ in most restaurants.)* .
(٢) مەشق؛ پەراوە *( P~ makes perfect.)* .
(٣) کارامەیی و شارەزایی (لەئەنجامی مەشق کردندا): *( He's out of ~ .)* .
(٤) بەکارهێنان؛ خستنەکار: *( Theory is useless without ~ .)*
(٥) پیشەگەری؛ خەریک بوون بە پیشەیەکەوە: *( the ~ of law)*
(٦) پیلان؛ فرووفێڵ. (٧) ڕێبازی بەڕێوەبردنی کاروباری دادگا.

**in practice,** بە کردەوە؛ بە کردار.

**put into practice,** جێبەجێکردن (نەخشە)؛ خستنەکار؛ ئیش پێکردن (یاسا، بیرورا، نەخشە).

**practiced** (prak′tist), *adj.* (١) قاڵ؛ شارەزا (لەئەنجامی مەشق کردنەوە)؛ بزان (٢) لە مەشقەوە فێربوو؛ ئەنجامی ڕاهاتن یا مەشقە

**practise** (prak′tis), *v.t. & v.i.* = practice.

**practitioner** (prak-tish′ən-ēr), *n.* (١) پیشەگەر:

*( a medical ~ )*
(۲) کەسێکە کە خەریکی خەڵك چاکردنەوەیە لەڕێی ئاینەوە (خاچ پەرستی).
**prae-** (prē), = pre-
**praedial, predial** (prē′di-əl), *adj.* هی زەوی‌وزارو حاسوو؛ هی موڵك.
**praemunire** (prē′myoo-nī′rē), *n.* (۱) تاوانی بێگانەپەرستی (لە ئینگلتەرەی کۆندا). (۲) تاوانبارکردنی کەسێك بەم شێوەیە. (۳) سزای ئەم تاوانە.
**praenomen** (prē-nō′men), *n.* ناوی یەکەمی هاووڵاتی‌یەکی ڕۆمای کۆن
**praepostor, prepostor** (prē-pos′tẽr), *n.* قوتابی چاودێر (لە هەندێ قوتابخانەی تایبەتی ئینگلیزیدا).
**praetor** (prē′tẽr, prē′tôr), *n.* دادپرسی ڕۆمای کۆن.
**praetorian** (pri-tôr′i-ən, pri-tō′ri-ən), *adj.* (۱) تایبەتی بە " praetor " (۲) هی پاسەوانی ئیمپراتۆری ڕۆمای کۆن.
*n.* (۱) praetor . (۲) پاسەوانی ئیمپراتۆری ڕۆمای کۆن
**pragmatic** (prag-mat′ik), *adj.* (۱) کردەنی؛ کردنخوازی؛ تایبەتی بە جێبەجێکردن نەك خەیاڵ پڵاوی. (۲) چالاك (۳) خۆتێهەڵقورتێنێر (٤) هی کاروباری کۆمەڵ یا وڵات (٥) تایبەتی بە ڕووداوو دیاردەی مێژوویی و پەیوەندی‌یان بەیەکەوە. (٦) تایبەتی بە فەلسەفەی " pragmatism "
*n.* (۱) pragmatic sanction . (۲) کردەنی؛ کردنخواز. (۳) خۆتێهەڵقورتێنەر
-pragmatical *(adj.)*; pragmatically *(adv.)*.
**pragmatism** (prag′mə-tiz'm), *n.* (۱) ڕێبازی کردنخوازی نەك خەیاڵ پڵاوی (۲) فەلسەفەیەکی ئەمەریکایی‌یە دەڵێت، کە باش‌و خراپی بیروڕایەك یا ڕێبازێك دەکەوێتە سەر ئەنجامەکانی.
**pragmatist** (prag′mə-tist), *n.* (۱) کەسێکە کە بەپێی باری ژیان‌و ڕێبازو کاروباری خۆی دەگونجێنێ‌و دەگۆڕێ؛ کردەنی؛ کردنخوازی. (۲) پەیڕەویکەری فەلسەفەی " pragmatism ".
**prairie** (prâr′i), *n.* دەشتی فراوانی گیایاوی یا ڕووتەنی بێ داروردەخت (بەتایبەتی هی ناوەڕاستی ئەمەریکا).
**prairie breaker,** جۆرە گاسنێکە (خاکەکە بەتەواوی هەڵدەگێڕێتەوە).
**prairie chicken,** مریشکە کێوی (لە دەشتەکانی ناوەڕاستی ئەمەریکادا هەیە).
**prairie dog,** سەگی دەشتی: گیاندارێکی کرۆژەندەیە لە سموزە دەچێ.
**prairie schooner,** گالیسکەی دەشتی: گالیسکەیەکی گەورەی سەرگیراوە کۆچەرەکانی زووی ئەمەریکا پێی دەچوون بۆ ئاوەدانکردنەوەی بەشی ڕۆژاوای وڵاتەکە
**praise** (prāz), *v.t.* (۱) هەڵسەنگاندن: نرخ لەسەر دانان. (۲) ستایش کردن. پەسەندکردن؛ پیاهەڵدان؛ ئافەرین کردن. (۳) شکۆپێدان؛ مەزن کردن؛ پەرستن؛ گەورەکردن: *( to ~ God)* .
*n.* (۱) ستایش: بە شان‌و باڵدا هەڵدان؛ پەسەندکاری؛ شکۆپێدان. (۲) [Archaic]. هۆی ستایش کردن. (۳) [Obs.]. کەس یا شتی ستایش کراو یا شکۆپێدراو
**sing one's praise ( or praises ),** زۆر ستایش کردن؛ زۆر پیاهەڵدان
**praiseworthy** (prāz′wũr′*th*i), *adj.* جێی ستایش کردنە؛ شایستەی ستایش‌و شکۆپێدانە؛ زۆر پەسەند.
-praiseworthily *(adv.)*; praiseworthiness *(n.)*.
**praline** (prä′lēn, prā′lēn), *n.* پرەلین: شیرینی‌یەکە لە گوێز یا بادەم‌و شەکری کوڵاو دروست دەکرێت.
**pram** (pram), *n.* [British Colloq.], = perambulator.
**prance** (prans, präns), *v.i.* (۱) شاخ کردن: لەسەر پاشوو وەستان (ئەسپ)؛ جامبازەکردن. (۲) سواری ئەسپێك بوون کە شاخ بکاو هەڵتووزێنێ. (۳) هەڵتووزان؛ جووتەلێدان بە ئاسماندا‌و یاری کردن. (٤) خۆنوواندن؛ بەقنجی بە ڕێگادا ڕۆیشتن؛ خۆبادان. (٥) خۆنوواندن‌و فیزلێدان بە سواری ئەسپەوە.
*v.t.* شاخ بە ئەسپ کردن؛ وا لە ئەسپ کردن کە هەڵتووزێنێ‌و یاری بکات.
*n.* شاخ کردن؛ هەڵتووزان؛ یاری کردن؛ خۆبادان؛ جامبازە (ئەسپ).
**prank** (praŋk), *n.* (۱) تەشقەڵە؛ پەنگ؛ گاڵتەوگەپ؛ یاری. (۲) هەڵتووزان‌و یاری کردنی گیاندار
**prank** (praŋk), *v.t.* خۆ ڕازاندنەوە (بۆ خۆ بادان بە کەش‌وفشەوە).
*v.i.* خۆبادان؛ خۆنوواندن بەکەش‌وفشەوە.
**prankish** (praŋk′ish), *adj.* (۱) گاڵتەوگەپی؛ حەزکەر لە تەشقەڵە؛ قۆشمە: *( ~ acts)* . (۲) لە تەشقەڵە چوو؛ وەك گاڵتەوگەپ وایە.
**prankster** (praŋk′stẽr), *n.* تەشقەڵەباز.
**prat** (prat), *n.* [Vulgar], سمت؛ قنگ؛ کەفەل.
**prate** (prāt), *v.i. & v.t.* چەنەبازی کردن؛ زۆروێژی کردن؛ هەڵەوەڕی کردن.
*n.* چەنەبازی؛ زۆروێژی؛ هەڵەوەڕی.
**pratfall** (prat′fôl′), *n.* [Slang], کەوتن بە قنگدا.
**pratincole** (prat′iŋ-kōl′), *n.* باڵندەیەکی کەنارئاوە لە پەڕەسێلکە دەچێ.
**pratique** (pra-tēk′, prat′ik), *n.* بڕوانامەی تەندروستی یا کەرەنتینەی دراو بە کەشتی (کە ڕێی دەدات بچێتە ناو دەریاوە).
**prattle** (prat′'l), *v.i. & v.t.* (۱) چەنەبازی کردن؛ زۆروێژی کردن؛ هەڵەوەڕی کردن. (۲) گڕوگاڵ کردن.
*n.* (۱) چەنەبازی؛ زۆروێژی؛ هەڵەوەڕی. (۲) گڕوگاڵ.
**prawn** (prôn), *n.* کوللەی دەریا (هی گەورە)؛ ڕۆبیان.
*v.i.* ڕاوە کوللەی دەریا کردن.
**praxis** (prak′sis), *n.* (۱) خستنەکاری بیروباوەڕ؛ جێبەجێکردنی کرداری (۲) نەریت؛ دەستوور؛ پیشە؛ خوو. (۳) مەشق؛ ڕاهێنان؛ نموونەی مەشق (ڕێزمان).
**pray** (prā), *v.t.* (۱) پاڕانەوە؛ تکاکردن؛ داواکردن: *( P~ tell me.)* . (۲) نزاکردن؛ دۆعاکردن. (۳) هێنانەدی لەڕێی نزاکردن یا پاڕانەوەوە.
*v.i.* نوێژکردن.
**prayer** (prâr), *n.* (۱) نزا؛ دۆعا (۲) نزاکردن؛ دۆعاکردن. (۳) نوێژ. (٤) پاڕانەوە (لە خوا)؛ داوا. (٥) داوا؛ ئاوات.
**prayer** (prā′ẽr), *n.* نوێژکەر.
**prayer book,** پەرتووکی نوێژ
**prayerful** (prâr′fəl), *adj.* زۆر نوێژکەر؛ لەخواترس؛ بەئاین
**pre-** (prē), پێشگرێکە بەمانای: (أ) بەر لە؛ لەپێش (کات): *( prewar; prearrange)*
(ب) لەبەردەم؛ لەپێش (شوێن): *( preaxial)* .
(ج) لەسەروو؛ بەرزتر؛ مەزنتر: *( pre-eminent)* .
(د) لەپێش (پلە)؛ پێشەکی: *( Preschool)* .
**preach** (prēch), *v.i.* (۱) پەندو ئامۆژگاری ئاینی ووتن یا خوێندنەوە (لە کڵێسە، مزگەوت... هتد). (۲) پەندو ئامۆژگاری ڕەووشتی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئاینی ووتن بەشێوەیەکی ووشك‌و ناخۆش
*v.t.* (۱) بانگ بۆ دان؛ لایەنگری کردن (بە نووسین‌و بە دەم): *( He ~es morality but lives an immoral life.)*
(۲) پەندو ئامۆژگاری ئاینی ووتن یا خوێندنەوە (لە کڵێسە، مزگەوت... هتد).
**preacher** (prē′chẽr), *n.* (۱) قەشە؛ مەلا. (۲) بانگ بۆ دەر؛ پەندبێژ
**preachify** (prē′chə-fī′), *v.i.* [Colloq.], ئامۆژگاری کردن‌و پەند ووتن بەشێوەیەکی ووشك‌و ناخۆش‌و بێ تام.
**preachment** (prēch′mənt), *n.* (۱) ئامۆژگاری‌و پەندی ئاینی ووتن یا خوێندنەوە (۲) ئامۆژگاری‌و پەندی ڕەووشتی‌و کۆمەڵایەتی ووشك‌و ناخۆش

**preachy** (prē′chi), *adj.* [Colloq.]. حەز لە ئامۆژگاری کردن و پەند
وتن و خەڵك خستنە سەر ڕێی خۆی و بانگدان بۆ ڕێبازێکی تایبەتی دەکات.
**-preachiness** *(n.).*
**preamble** (prē′am′b'l, prē-am′b'l), *n.* (١) پێشەکی (بەتایبەتی
هی دەستوور، یاسا... هتد)؛ سەرەتا. (٢) ڕووداوێکی پێشەکی (کە نیشانەی
ئەوەیە کە لەدوایەوە دێت)؛ سەرەتا (ڕووداو).
**prearrange** (prē′ə-rānj′), *v.t.* ڕێکخستن لەپێشەوە یا پێشەکی.
**prearrangement** (prē′ə-rānj′mənt), *n.* ڕێکخستنی پێشەکی
یا پێش کاتی خۆی
**preaxial** (prē-ak′si-əl), *adj.* لەپێش تەوەری لەشدایە (توێکاری).
**prebend** (preb′ənd), *n.* (١) خەڵات یا پێ بەخشراوی کڵێسە
(٢) مووچەی قەشە کە لەم خەڵاتە دەدرێ. (٣) قەشەی مووچەخۆری وەها.
**prebendary** (preb′ən-der′i), *n.* (١) قەشەی مووچەخۆر.
(٢) قەشەی هەر بەناو مووچەخۆر.
**precancel** (prē-kan′s'l), *v.t.* بەتاڵکردنەوەی پووڵی پۆستە پێش
بەکارهێنانی.
*n.* پووڵی پۆستەی بەتاڵکراوە پێش بەکارهێنانی
**precarious** (pri-kâr′i-əs), *adj.* (١) لەسەر هەوەسی کەسێکی تر
بەندە: *( a ~ allowance)*.
(٢) پڕ مەترسی: *( a ~ life)*.
(٣) دوورەختی؛ شلۆق: *( a ~ situation)*
(٤) لەسەر بنچینەیەکی پتەو دانەڕێژراوە؛ گومانی لێ دەکرێ:
*( a ~ conclusion)*
**-precariously** *(adv.)*; **precariousness** *(n.).*
**precative** (prek′ə-tiv), *adj.* = **precatory.**
**precatory** (prek′ə-tôr′i, prek′ə-tō′ri), *adj.* پاڕانەوەیی؛
هی تکاکردن
**precaution** (pri-kô′shən), *n.* (١) وریایی پێشەکی؛ ئاگاداری
(بۆ ڕوونەدانی شتی خراپ) (٢) کارێکە پێشەکی دەکرێ بۆ ئاگربڕکردن یا
نەهێشتنی ڕوودانی شتی خراپ:
*( to take ~s against flood, fire, illness, etc.)*
**precautionary** (pri-kô′shən-er′i), *adj.* تایبەتی بە وریایی و
ئاگاداری پێشەکی؛ هی ئاگربڕکردن:
*( to take ~ measures against attack)*
**precautious** (pri-kô′shəs), *adj.* وریا؛ ئاگادار؛ ئاگا لە خۆ بوو:
*( a ~ person)*
**-precautiously** *(adv.)*; **precautiousness** *(n.).*
**precede** (pri-sēd′, prē-sēd′), *v.t.* (١) لەپێشدا بوون؛
لەپێشتردا بوون، ڕوودان، یا هاتن. (٢) لەبەردەمەوە بوون یا هاتن.
(٣) لەپێشتر بوون (پلەوپایە)؛ گەورەتر یا بەرزتر بوون؛ پایەدارتر بوون.
(٤) دەستپێکردن بە؛ پێشەکی پێشکەش کردن:
*( He ~d his speech with an anecdote.)*
**precedence** (pri-sē′d'ns, pres′ə-dəns), *n.* (١) گرنگتر؛
لەپێشتر بوون (کات، شوێن، گرنگی)؛ یەکەمێتی (گرنگی):
*( Financial security takes ~ over other matters.)*
(٢) لەپێشتر ڕوودان و بوون بە نموونە بۆ ڕووداوی تری وەها لە دواڕۆژدا؛
پێشینەیی: *( Is there any ~ for this?)*.
(٣) پایە بەرزتری؛ مەزنتری؛ گەورەتری.
**precedency** (pri-sē′d'n-si, pres′ə-dən-si), *n.* =
**precedence.**
**precedent** (pri-sē′d'nt), *n.* پێشینە؛ ڕووداوێك، کردەوەیەك،
یا بڕیارێکە کە دەبێتە نموونە و بەڵگە بۆ ڕوودان، کردەوە، یا بڕیاری تری
وەها لە دواڕۆژدا:
*( to set a ~ ; There is no ~ for this.; That would create a ~ .)*
*adj.* لەپێشدا هاتوو (کات، شوێن، گرنگی).

**precedential** (pres′ə-den′shəl), *adj.* (١) نموونە و بەڵگەیە
بۆ ڕوودانی تری وەها لە دواڕۆژدا.
(٢) لەپێشەوە بوون (کات، شوێن، گرنگی).
**preceding** (pri-sēd′iŋ), *adj.* پێشوو (کات، شوێن)؛ ڕابوردوو:
*( the ~ day; the ~ paragraphs)*
**precentor** (pri-sen′tēr), *n.* سەرتیپی ئینجیل خوێندنەوە بە دەنگ و
ئاوازەوە لە کڵێسەدا.
**precept** (prē′sept), *n.* (١) ئامۆژگاری (دەربارەی ڕەووشت)؛
فەرمان (هەڵسان و دانیشتن)؛ پەیڕەو (ڕەفتار):
*( Example is better than ~ .)*
(٢) پەند؛ وتەی بەجێ. (٣) پەیڕەو.
(٤) فەرمانی دادگا.
**preceptive** (pri-sep′tiv), *adj.* (١) پەیڕەوی (ڕەووشت)؛ فەرمانی.
(٢) پەندی؛ فێرکەر؛ تەمێکەر.
**preceptor** (pri-sep′tēr), *n.* مامۆستا؛ فێرکەر.
**preceptress** (pri-sep′tris), *n.* مامۆستای ژن.
**precession** (pri-sesh′ən, prē-sesh′ən), *n.*. (١) **precedence**
(٢) بەمێواشی خولانەوەی تەوەری تەنێکی خولاوە بەدەوری تەوەرێکی
تردا (فیزیا). (٣) **precession of the equinoxes** .
**precession of the equinoxes,** زووتر ڕۆژگەڕانەوەی بەهار و
پاییز لە ساڵی پێشوو (ئەستێرەوانی).
**precinct** (prē′siŋkt), *n.* (١) حەوشەی کڵێسە. (٢) *(pl.)* ، گەڕەك.
(٣) (ا) ناوچە یا گەڕەکی قۆڵێك پۆلیس. (ب) بنکەی پۆلیسی گەڕەك.
(٤) ناوچە یا گەڕەکی هەڵبژاردن: *( election ~s)* .
(٥) سنوور: *( within the city ~s)* .
**preciosity** (presh′i-os′ə-ti), *n.* بەقێزوبێزی لە زماندا؛
خۆ تەسك کردنەوە لە زماندا.
**precious** (presh′əs), *adj.* (١) بەنرخ؛ گران؛ نایاب: *( ~ metals)* .
(٢) بەنرخ: *( Freedom is ~ .)* .
(٣) خۆشەویست. (٤) بەقێزوبێز.
(٥) زۆر خراپ و ناپەسەند؛ بەد؛ زۆڵ و ناکەس بەچە.
(٦) [Colloq.]، تەواو؛ زۆر؛ ئێجگار: *( a ~ liar)* .
*n.* کەسێکی خۆشەویست.
*adv.* زۆر؛ لە ڕادەبەر: *( He had ~ little money.)* .
**-preciousness** *(n.).*
**precious stone,** بەردی بەنرخ.
**precipice** (pres′ə-pis), *n.* (١) هەزار بە هەزار؛ قەدپاڵی زۆر لێژ؛
لێژگە؛ لێژایی سەخت. (٢) باری پڕ مەترسی؛ دۆخی نزیك لە کارەساتەوە.
**precipitance** (pri-sip′ə-təns), *n.* هەڵەشەیی؛ زۆر پەلەکردن.
**precipitancy** (pri-sip′ə-tən-si), *n.* = **precipitance.**
**precipitant** (pri-sip′ə-tənt), *adj.* (١) بەسەرا کەوتووە خوارەوە.
(٢) هەڵەشە؛ زۆر پەلەکەر.
*n.* نیشتێنەر (کیمیا)؛ ماددەی نیشتێنەر.
**precipitate** (pri-sip′ə-tāt′), *v.t.* (١) بەسەرا فڕێدانە خوارەوە.
(٢) پەلە لێکردن (ڕوودانی شتێك)؛ بوون بە هۆی ڕوودان لەپێش کاتی خۆیدا:
*( He ~d the crisis.)*
(٣) نیشاندن (کیمیا).
(٤) خەستکردنەوە؛ گۆڕینی هەڵم بۆ باران و بەفرو سەهۆڵ.
*v.i.* (١) نیشتن (کیمیا).
(٢) خەستبوونەوە؛ گۆڕانی هەڵم بۆ باران و بەفرو سەهۆڵ.
*adj.* (١) بەسەرا کەوتووە خوارێ. (٢) هەڵەشە؛ سەرچڵ.
(٣) لەپڕ؛ کوتوپڕ؛ زۆر خێرا.
*n.* نیشتوو (کیمیا)؛ ماددەی نیشتوو.
**-precipitateness** *(n.)*; **precipitator** *(n.).*
**precipitation** (pri-sip′ə-tā′shən), *n.* (١) بەسەرا کەوتنە

خواردوه. (٢) هەنمشەیی؛ سەرچڵی. (٣) پەلەلێکردن؛ پەلە.
(٤) (ا) نیشتن (کیمیا). (ب) ماددەی نیشتوو.
(٥) (ا) داران ‌دارین؛ بەفرباریین. (ب) نەرمە باران؛ باران؛ بەفر.
(ج) چەندێتی باران یا بەفر.

**precipitin** (pri-sip'ə-tin), *n.* دژەتەنێکە لە کوتان یا تەرمانی تایبەتی کردنە لەشەوە پەیدادەبێت.

**précis** (prā-sē', prā'sē), *n.* کورتەی ووتار؛ پوختەی ووتار یا باس.

**precise** (pri-sīs'), *adj.* (١) روون؛ وورد؛ دیار. ***( ~ concepts)***.
(٢) وورد (مرۆ)؛ ووردکار
(٣) بێ کەم و زۆر؛ تەواو. ***( the ~ amount)***.
(٤) زۆر بایەخدەر بە شتی بچووك.

**-preciseness** *(n.).*

**precisely** (pri-sīs'li), *adv.* (١) بەووردی؛ بەتەواوی.
(٢) بێ زیادوکەم؛ کتومت؛ بەڵێ زۆر راستە؛ وایە.

**precisian** (pri-sizh'ən), *n.* کەسێکی توندوتیژ (بەتایبەتی لە پەیرەوی کردنی ئایندا).

**precision** (pri-sizh'ən), *n.* ووردی؛ تەواوی؛ بێ کەم‌وزیادی.
*adj.* وورد؛ ووردکاری؛ بۆ ووردکاری کراوە:
***( ~ bombing, instruments, tools, etc.)***

**precisionist** (pri-sizh'ən-ist), *n.* کەسێکی وورد یا ووردکار

**preclinical** (prē-klin'i-k'l), *adj.* هی ماوەی پێش دەرکەوتنی نیشانەی نەخۆشییەك.

**preclude** (pri-klōōd'), *v.t.* نەکردنەوە؛ پێشەکی ڕێ لێ بەستنەوە؛ پێشەکی نەهێشتن ***. ( His attitude ~s a solution to the problem.)***

**preclusion** (pri-klōō'zhən), *n.* نەکردنەوە؛ نەهێشتن؛ پێشەکی ڕێ لێ بەستنەوە

**preclusive** (pri-klōō'siv), *adj.* رێ لێ بەستەرەوە؛ کۆسپ.

**precocial** (pri-kō'shəl), *adj.* هی بەچکە باڵندەی زوو پێگەیشتوو؛ هی بەچکەی ئەو باڵندانەی کە هەر لە هەڵهاتنەوە پەڕیان دەرکردووە و زیتەڵەن.

**precocious** (pri-kō'shəs), *adj.* (١) بەر لە کاتی خۆی پێگەیشتوو (بەتایبەتی منداڵی زیرەك). ***( a ~ child)***
(٢) بەر لە کاتی خۆی هەراش بوو.
(٣) لەپێش چرۆکردندا خونچە پشکوتوو.

**precociously** (pri-kō'shəs-li), *adv.* بە زوو پێ گەیوی؛ بە زوویی هەراش بوو

**precociousness** (pri-kō'shəs-nis), *n.* زوو پێ گەیین؛ زوو هەراش بوون.

**precocity** (pri-kos'ə-ti), *n.* زوو پێ گەیین؛ زوو هەراش بوون.

**preconceive** (prē'kən-sēv'), *v.t.* پێشەکی هێنانە بەرچاوی خۆ؛ پێشەکی بڕیاردان یا هەڵوێست وەرگرتن: ***( a ~d idea)***.

**preconception** (prē'kən-sep'shən), *n.* (١) پێشەکی هێنانە بەرچاوی خۆ یا بڕیاردان دەربارەی. (٢) بڕیاری نەبەکام؛ بیروڕای کاڵ و کرچ.
(٣) لایەنگری بە لایەکدا داتاشین

**preconcert** (prē'kən-sûrt'), *v.t.* پێشەکی رێکەوتن.

**precondition** (prē'kən-dish'ən), *n.* مەرجی پێشەکی.
*v.t.* پێشەکی راهێنان

**precook** (prē-kōōk'), *v.t.* پێشەکی کوڵاندن یا نیمچە کوڵاندن.

**precritical** (prē-krit'i-k'l), *adj.* پێش باری تەنگ‌وچەڵەمەیی.

**precursor** (pri-kûr'sēr), *n.* (١) نیشانەی پێشەکی؛ نیشانەی شتی داهاتوو یا دوارۆژ؛ پێشەنگ؛ بەرایی:
***( The early snow was the ~ of a cold winter.)***
(٢) پێشین (لە کاربەدەستیدا).
(٣) ماددەیەکە کە لە رزین یا گۆڕینی کیمیایی ماددەیەکی تر پەیدا دەبێت.

**precursory** (pri-kûr'sə-ri), *adj.* (١) نیشانەی دوارۆژ یا شتی داهاتووە. (٢) سەرەتایی؛ پێشەکی.

**predaceous, predacious** (pri-dā'shəs), *adj.* = predatory.

**predacity** (pri-das'ə-ti), *n.* زیانەخۆری؛ راوچێتی (بۆ گۆشت)؛ درندەیی.

**predate** (prē-dāt'), *v.t.* (١) بەرواری پێشتر لەسەر دانان (چەك، بڕوانامە... هتد).
(٢) لەپێشدا بوون؛ لەپێشتردا ڕوودان، بوون، یا پەیدابوون:
***( Hunting ~s agriculture.)***

**predation** (pri-dā'shən), *n.* (١) زیانەخۆری؛ گیانداری تر خواردن.
(٢) تاڵانکردن؛ تاڵانکاری

**predator** (pred'ə-tēr), *n.* (١) زیانەخۆر؛ راوچی؛ درندە.
(٢) تاڵانکەر

**predatory** (pred'ə-tôr'i, pred'ə-tō'ri), *adj.* (١) تاڵانکەر؛ ڕووتکەرەوە: ***( a ~ band of people)***.
(٢) زیانەخۆر؛ راوچی؛ درندە: ***( A lion is a ~ animal.)***.

-predatorily *(adv.)*; predatoriness *(n.).*

**predecease** (prē'di-sēs'), *v.t.* لەپێش کەسێکی تردا یا ڕووداوێکدا مردن.

**predecessor** (pred'ə-ses'ēr, pred'ə-ses'ēr), *n.* (١) پێشین؛ پێشتر (کاربەدەست)؛ پێشوو. (٢) شتێکە کە شتێکی تر شوێنەکەی گرتووەتەوە.
(٣) باوو باپیر

**predestinarian** (pri-des'tə-nâr'i-ən), *adj.* (١) چارەنووسی.
(٢) بڕوابوو بە چارەنووس.
*n.* کەسێکە کە بڕوای بە چارەنووسە.

-predestinarianism *(n.).*

**predestinate** (pri-des'tə-nit), *v.t.* (١) لە چارە نووسین؛ وەها بۆ بڕینەوە. (٢) پێشەکی بڕیاردان.
*adj.* وەها لە چارەنووسی نووسراوە؛ ئەوە چارەنووسیەتی.

**predestination** (pri-des'tə-nā'shən), *n.* (١) (ا) چارەنووس بۆ بڕینەوە (ئاین). (ب) چارەنووس بۆ برانەوە. (٢) چارەنووس؛ خواخواست

**predestine** (pri-des'tin), *v.t.* (١) لە چارە نووسین؛ وەها بۆ بڕینەوە.
(٢) پێشەکی بڕیاردان.

**predeterminate** (prē'di-tûr'mə-nit), *adj.* پێشەکی بڕیاردراو

**predetermination** (prē'di-tûr'mə-nā'shən), *n.* (١) لە چارە نووسین؛ لە چارە نووسران. (٢) پێشەکی بڕیاردان.
(٣) پێشەکی لایەنگری کردن.

**predetermine** (prē'di-tûr'min), *v.t.* (١) پێشەکی بڕیاردان
(٢) پێشەکی لارەسەنگ کردن یا بە لایەکدا خستن؛ پێشەکی لایەنگری کردن

-predeterminer *(n.).*

**predial** (prē'di-əl), *adj.* = praedial.

**predicable** (pred'i-kə-b'l), *adj.* (١) لەسەر بنچینەیەکی تایبەتی بەندبوو یا دانراو. (٢) دووپاتکراوەتەوە؛ دیسان دان پیانراو یا ووتراوە.
*n.* تایبەخۆیەك کە دەتوانرێ دانی پیا بنرێ یا نەنرێ (ژیربێژی، زمان).

**predicament** (pri-dik'ə-mənt), *n.* (١) تەنگ‌وچەڵەمە؛ گیروگرفت؛ بارێکی گیروگرفتاوی و ناخۆش. (٢) بابەت (ژیربێژی)؛ جۆر

**predicate** (pred'i-kāt'), *v.t.* (١) [Rare] (بانگ بۆ دان؛ ووتن؛ بڵاوکردنەوە. (٢) دان پیانان (تایبەخۆ، نیشانە)؛ چەسپاندن:
***( Let us ~ greenness of grass.)***
(٣) وا گەیاندن؛ وا گرتنەوە: ***( Grass ~s greenness.)***.
(٤) لەسەر بناغەیەکی تایبەتی دانانی بیروڕایەك یا کردارێك.
*v.i.* ووتن؛ چەسپاندن؛ ووتنەوە
*n.* (١) گوزارە (رێزمان)؛ ئەو بەشەی رستەیە کە لە بکەر دەدوێ. (ووشەی " blows " لە رستەی " The wind blows "، لە رستەی " blows from the east " ، " The wind blows from the east " وە " threw the ball "

له ڕستەی " **John threw the ball.** "دا.
(٢) تایبەخۆیەکی دان پیانراو یا پیانەنراوی شتێك (ژیربێژی).
***adj.*** (١) لەسەر بنچینەیەکی تایبەتی دانراو.
(٢) گوزارەیی (ڕێزمان): لە بکەر دوواو: ***( a ~ noun)*** .
**predication** (pred´i-kā′shən), ***n.*** (١) دووبارە دان پیانان
(ژیربێژی). (٢) لەسەر بناغەیەك دانان: لەسەر شتێك بەندبوون.
(٣) گوزارە (ڕێزمان).
**predicatory** (pred′i-kə-tôr´i, pred′i-kə-tō´ri), ***adj.*** هی
بانگ بۆ دان: هی پەندو ئامۆژگاری ئاینیو ڕەووشتی ووتن.
**predict** (pri-dikt′), ***v.t. & v.i.*** پێشبینی کردن؛ پێشبینین:
موفلانە لێدان؛ قراندن.
**predictable** (pri-dik′tə-b'l), ***adj.*** پێشبینی دەکرێ:
پێشەکی زانراو: ***( a ~ behavior, act, person, etc.)*** .
**-predictability** ***(n.).***
**predictive** (pri-dik′tiv), ***adj.*** تایبەتی بە پێشبینی کردن
**predictor** (pri-dik′tēr), ***n.*** (١) پێشبینکەر
(٢) ئامێری پێشبینی: ئامێرێکی فڕۆکەشکێنە لێکی دەداتەوە کەی مووشەکەکە
بتەقێنرێتە فڕۆکەی دوژمن
**predilection** (prē´də-lek′shən, pred′'l-ek′shən), ***n.*** حەز:
لایەنگری؛ بەلاوە باشتربوون.
**predispose** (prē´dis-pōz′), ***v.t.*** (١) والێکردن؛ پێشەکی ئامادەکردن
بۆ لایەنگری یا کردنی شتێك:
***( His good manners ~ people to like him.)***
(٢) [Archaic]. پێشەکی برینەوە یا ڕێکەوتن لەسەر
**predisposition** (prē´dis-pə-zish′ən), ***n.*** (١) والێکردن:
پێشەکی ئامادەبوون بۆ لایەنگری یا کردنی شتێك
(٢) حەزی پێشەکی؛ ئارەزوو؛ ئامادەیی پێشەکی.
***( a ~ to find fault with everybody)***
**predominance** (pri-dom′ə-nəns), ***n.*** (١) زاڵی
(٢) زۆربەیی؛ زۆری؛ بڵاوبوونەوە
**predominancy** (pri-dom′ə-nən-si), ***n.*** = **predominance.**
**predominant** (pri-dom′ə-nənt), ***adj.*** (١) بەدەسەلاتتر لە هەموو؛
زاڵ. (٢) دیارتر لە هەموو؛ زۆرتر؛ بەهێزتر:
***( The ~ feature of his character was pride.)***
**predominantly** (pri-dom′ə-nənt-li), ***adv.*** زۆربەی زۆری:
بەزۆری ***( The country is ~ Catholic.)***
**predominate** (pri-dom′ə-nāt´), ***v.i.*** (١) زاڵبوون بەسەردا؛
دەست بەسەردا ڕۆیشتن؛ جڵەو بەدەست بوون
(٢) بەهێزترو زۆرتربوون لە: ***( a forest in which pine-trees ~ )*** .
**-predominately** ***(adv.)***; **predominatingly** ***(adv.)***;
**predomination** ***(n.).***
**pre-eminence** (prē-em′ə-nəns), ***n.*** زاڵی؛ دەست ڕۆین؛
ناوبانگ پایەبەرزی
**pre-eminent** (prē-em′ə-nənt), ***adj.*** زاڵ؛ دەست ڕۆیو؛
بەناوبانگ؛ پایەبەرز ***( his ~ position among his colleagues)*** .
**-pre-eminently** ***(adv.).***
**pre-empt** (prē-empt′), ***v.t.*** (١) دەستپێشکەری کردن لە کڕیندا
(بەتایبەتی زەوی‌وزاری میری لەڕێی نیشتەجێ بوون تیایدا پێش خەڵکی تر).
(٢) دەستبەسەرداگرتن لەپێش خەڵکی ترەوە.
**-pre-emptor** ***(n.)***; **pre-emptory** ***(adj.).***
**pre-emption** (prē-emp′shən), ***n.*** (١) مافی کڕین لەپێش
خەڵکی تردا (بەتایبەتی هی زەوی میری بە چوونە ناوی پێش خەڵك)
(ب) کڕینی زەوی بەم جۆرە (ج) زەوی بەم جۆرە کڕاو
(٢) دەستبەسەرداگرتنی شتێك پێش خەڵکی تر
**pre-emptive** (prē-emp′tiv), ***adj.*** (١) تایبەتی بە کڕین یا مافی
کڕینی زەوی میری بە چوونە ناوی‌یەوە پێش خەڵکی تر.
(٢) هی دەستپێشکەری (بەتایبەتی هێرش بردنە سەر دوژمن):
***( a ~ attack against the enemy)***
**preen** (prēn), ***v.t.*** (١) پەڕ پاکردنەوەو ڕێکخستن بە دەنووك.
(٢) جلی جوان لەبەرکردن‌و خۆ ڕازاندنەوە.
(٣) شانازی بە خۆوە کردن؛ زۆر لە خۆ ڕازی بوون.
***v.i.*** بەرگی جوان لەبەرکردن‌و خۆ ڕازاندنەوە.
**pre-establish** (prē´ə-stab′lish), ***v.t.*** پێشەکی دامەزراندن.
**pre-exilian** (prē´ig-zil′i-ən, prē´ik-sil′i-ən), ***adj.*** تایبەتی
بە سەردەمی پێش دیلێتی جوولەکە لە بابل لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا.
**pre-exilic** (prē´ig-zil′ik, prē´ik-sil′ik), ***adj.*** =
**pre-exilian.**
**pre-exist** (prē´ig-zist′), ***v.i. & v.t.*** لەپێش کەسێك یا شتێکی
تردا بوون یا ژیان.
**pre-existence** (prē´ig-zis′təns), ***n.*** لەپێشتردا بوون یا ژیان
(بەتایبەتی گیان).
**pre-existent** (prē´ig-zis′tənt), ***adj.*** لەپێشتردا بوو؛
پێشتر لە کەسێك یا شتێکی تردا بوو.
**prefabricate** (prē-fab′rə-kāt´), ***v.t.*** (١) پێشەکی دروستکردن.
(٢) پێشەکی دروستکردنی بەشەکانی خانوویەك بۆ گواستنەوەو پێکەوەنانی
لە شوێنێکی تر.
-prefabrication ***(n.).***
**preface** (pref′is), ***n.*** (١) [P-] ، سەرەتای نوێژی کاسۆلیکی.
(٢) سەرەتا (پەڕتووك، ووتار)؛ پێشەکی.
***v.t.*** (١) پێشکەش کردن بە سەرەتا یا پێشەکی‌یەکەوە؛ بە سەرەتایەك
دەستپێکردن. (٢) بۆ بوون بە سەرەتا یا پێشەکی.
**prefatory** (pref′ə-tôr´i, pref′ə-tō´ri), ***adj.*** سەرەتایی؛
تایبەتی بە هی سەرەتا یا پێشەکی.
**prefect** (prē′fekt), ***n.*** (١) کاربەدەستێك یا فەرمانبەرێکی بەرزی
ڕۆمای کۆن. (٢) کاربەدەستێکی گەورە، بەتایبەتی: (ا) کاربەدەستی بەرزی
فەرەنسا. (ب) سەرۆکی پۆلیسی پاریس. (ج) بەڕێوەبەری دانشگایەکی ئاینی.
(٣) قوتابی چاودێر (بەتایبەتی لە قوتابخانەی تایبەتیدا).
**prefect apostolic,** کەشیشی گەورەی کاسۆلیکی.
**prefecture** (prē′fek-chēr), ***n.*** (١) دەسەلات‌و پلەوپایەی فەرماندەر.
(٢) جێنشینی فەرماندەر.
**prefer** (pri-fũr′), ***v.t.*** (١) سکالاکردن؛ شکات کردن:
***( He ~ed charges against her for theft.)***
(٢) بەلاوە باشتربوون؛ زیاتر حەزلێکردن: ***( I ~ tea to coffee.; He ~s reading to sports.)***
(٣) پلە پێدان؛ بەرزکردنەوە.
**preferable** (pref′ēr-ə-b'l, pref′rə-b'l), ***adj.*** باشترە لە:
***( Death is ~ to slavery.)***
-preferability ***(n.)***; **preferableness** ***(n.).***
**preference** (pref′ēr-əns, pref′rəns), ***n.*** (١) زیاتر حەزلێکردن؛
بەلاوە باشتربوون؛ حەزی زیاتر: ***( He has a ~ for younger women.)***
(٢) مافی هەڵبژاردن؛ هەل یا دەسەلاتی هەڵبژاردن:
***( You have your ~ of seats in the theatre.)***
(٣) شتی زیاتر حەزلێکراو؛ شتی زیاتر ویستراوو هەڵبژێراو:
***( What is your ~ ?)***
(٤) خاترگرتن لە قەرزدانەوە یا قەرز پێداندا؛ خاترگرتنی وولاتێك لە باجی
گومرگی‌و بازرگانی‌و شتی تردا.
**preferential** (pref´ə-ren′shəl), ***adj.*** (١) خاترگری؛ پێشخەری:
***( The sickest patients receive ~ treatment.)***
(٢) هی لایەنگری یا جیاوازیکاری: ***( ~ tariff rates)*** .
**preferment** (pri-fũr′mənt), ***n.*** (١) پلە پێدان؛ بەرزکردنەوە.

(٢) پلەوپایەی پێدراو؛ پلەی بەرزی پێدراو.

**preferred stock,** بەشی هەڵبژاردە: ئەو بەشانەی کۆمپانیایەکە (لە بۆرسەدا) کە دەخرێتە پێش بەشی ئاسایی لە دابەشکردنی قازانج یا سەرمایەدا)

**prefiguration** (prē´fig-yoo-rā′shən), *n.* (١) نیشانەی ئەوە بوون؛ بەرایی شتێك بوون؛ پێشەکی شتێك گەیاندن.
(٢) نیشانەی پێشەکی؛ نموونەی پێشەکی یا یەکەم.

**prefigure** (prē-fig′yēr), *v.t.* (١) نیشانەی ئەوە بوون؛ پێشەکی وا دەرخستن یا وا گەیاندن؛ نموونەی پێشەکی بوون بۆ؛ ڕێ بۆ پاکردنەوە (مەجاز).
(٢) هێنانە بەرچاوی خۆ؛ پێشەکی لێکدانەوە؛ پێشبینی.

**prefix** (prē-fiks′), *v.t.* (١) [Rare] پێشەکی چاك کردن.
(٢) دانان لەپێشی وشەیەکدا؛ پێشگر دانان لەبەردەم وشەدا.

*n.* پێشگر (ڕێزمان)؛ پێشبەند؛ پێشکۆ.

**preflight** (prē-flīt′), *adj.* هی پێش فڕین یا هەڵسانی فڕۆکە
*( ~ preparation)*

**preformation** (prē´fôr-mā′shən), *n.* (١) پێشەکی پێکهێنان؛ پێشەکی پێکهاتن. (٢) بیردۆزێکی کۆنەو باونەماوە کە دەڵێت: هەموو ئەندامەکانی زیندەوەرێك هەر لە سەرەتاوە لە تۆوەکەی یا شانە بنچینەیی‌یەکەیدا هەیەو تەنها ئەوەیە پەرە دەسەنن‌و دەبن بە زیندەوەری هەراش

**pregnable** (preg′nə-b'l), *adj.* داگیر دەکرێ: دەتوانرێ بگیرێ (قەڵا، سەنگەر)؛ ناقایم.

**pregnancy** (preg′nən-si), *n.* سکپڕی؛ ماوەی سکپڕی.

**pregnant** (preg′nənt), *adj.* (١) سکپڕ؛ ئاووس؛ دووگیان.
(٢) داهێنەر؛ زیرەك؛ خەیاڵ فراوان؛ دانا؛ زرنگ. (٣) بەبەر؛ بەپیت.
(٤) گرنگ؛ پڕ مانا؛ سەنگین: *( a ~ reply)* .
(٥) ( ~ with; ~ in )؛ پڕە لە.

**preheat** (prē-hēt′), *v.t.* پێشەکی گەرم کردن (وەك فڕن یا تەنوور).

**prehensile** (pri-hen′sil, pri-hen′s'l), *adj.* گیرندە؛ دەگیرێ بە پێچ خواردن بەدەوریدا (وەك کلکی مەیموون).

**prehension** (pri-hen′shən), *n.* (١) گرتن
(٢) (ا) هەستپێکردن. (ب) تێگەیشتن؛ سەر لێ دەرچوون.

**prehistoric** (prē´his-tôr′ik, prē´his-tor′ik), *adj.* *Also*- **prehistorical,** پێش مێژوو؛ بەر لە مێژوو.

**prehistory** (prē-his′tə-ri), *n.* پێش مێژوو
**-prehistorian** *(n.).*

**preignition** (prē´ig-nish′ən), *n.* سووتان یا داگیرسانی پێش کاتی (مەکینە).

**prejudge** (prē-juj′), *v.t.* پێشەکی بڕیاردان؛ بڕیاردان پێش زانینی هەمووشتێك دەربارەی مەسەلەکە یا کەسەکە.

**prejudgment, prejudgement** (prē-juj′mənt), *n.* بڕیاری پێشەکی (وشەی پێشوو ببینە).

**prejudice** (prej′oo-dis), *n.* (١) بڕیاری پێشەکی؛ بڕیاردان پێش زانینی هەمووشتێك دەربارەی مەسەلەیەك یا کەسێك.
(٢) لایەنگری کوێرانە؛ لایەنگری بێ ڕەوا؛ دەمارگیری؛ جیاوازی کردن لەگەڵدا:
*( a ~ against foreigners)*
(٣) قینی کوێرانە (دژی ڕەگەزو ئاین‌و ناوچەو وڵات‌و گەلێك شتی تر)؛ ڕەچەڵەك پەرستی. (٤) زیان (بەهۆی کردەوەو لایەنگری کوێرانەی خەڵك).

*v.t.* (١) زیان لێدان (بە هۆی لایەنگری بێ ڕەوا یا بڕیاری پێشەکی‌یەوە):
*( His mistake ~d the outcome.)*
(٢) قینی کوێرانە هەڵساندن؛ بوون بە هۆی لایەنگری کوێرانەو بێ ڕەوایانە.

**in ( or to ) the prejudice of,** بە جۆرێك کە زیان بگەیەنێ بە کەسێك، مافێك، یا داوایەك.

**without prejudice to,** بە جۆرێك کە نەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە مافێك یا داوایەك (دادگەری).

**prejudicial** (prej´oo-dish′əl), *adj.* زیان گەیێن؛ تایبەتی بە لایەنگری کوێرانەو بێ ڕەوایانەو زیان لێدان.

**prelacy** (prel′ə-si), *n.* (١) پلەوپایەی سەرەك قەشە.
(٢) سەرەك قەشەکان.
(٣) فەرمانڕەوایی سەرەك قەشەکان (لەڕووی سووکی‌یەوە).

**prelate** (prel′it), *n.* سەرەك قەشە؛ کاربەدەستێکی گەورەی کڵێسە.

**prelateship** (prel′it-ship´), *n.* پلەوپایەی سەرەك قەشە؛ ماوەی کاربەدەستی سەرەك قەشە.

**prelature** (prel′ə-chēr), *n.* (١) پلەی سەرەك قەشە.
(٢) سەرەك قەشەکان.

**prelect** (pri-lekt′), *v.i.* وانە ووتنەوە (لە زانکۆ)؛ ووتار خوێندنەوە.
**-prelection** *(n.)*; **prelector** *(n.).*

**prelibation** (prē´lī-bā′shən), *n.* پێشەکی چەشتن؛ بەرکوڵی خواردنەوە؛ نۆبەرەی خواردنەوە.

**preliminary** (pri-lim′ə-ner´i), *adj.* سەرەتایی؛ پێشەکی:
*( a ~ examination, report, etc.)*

*n.* (١) *(pl.)* ، شتێکی پێشەکی یا ئامادەیی (کردار، هەنگاو، کاروبار).
(٢) تاقیکردنەوەی سەرەتایی (پێشی دەووترێ: " **prelim** ").
(٣) ڕووداوی پێش ملەملانێیەکی وەك زۆرانبازی‌و بۆکسبازی.
(٤) *(pl.)*، پەڕەکانی پێش دەقی پەرتووکێك (چاپەمەنی).

**preliterate** (prē-lit′ēr-it), *adj.* (١) هی بەر لە پەیدابوونی نووسین.
(٢) هی گەلێکی بێ شتی نووسراو؛ هی کۆمەڵێکی فێری نووسین نەبوو

**prelude** (prel′ūd, prē′lood), *n.* (١) سەرەتا (کردار، داستان، هۆنراوەی درێژ، شانۆنامە، ڕووداوی داهاتوو)؛ پێشەکی.
(٢) (ا) پارچەیەکی کورت مۆسیقا کە سەرەتای پارچەیەکی درێژە.
(ب) پارچەیەك مۆسیقای ڕۆمانسی کورت.

*v.t.* (١) بۆ بوون بە سەرەتا یا پێشەکی.
(٢) دەستپێکردن یا پێشکەش کردن بە سەرەتا.

*v.i.* (١) بۆ بوون بە سەرەتا. (٢) پارچەیەك مۆسیقای سەرەتایی لێدان

**prelusion** (pri-loo′zhən), *n.* = **prelude.**

**prelusive** (pri-loo′siv), *adj.* سەرەتایی؛ پێشەکیتی.

**premature** (prē´mə-tyoor′, prē´mə-choor′), *adj.* پێش کاتی خۆی؛ نەبەکام؛ پێ نەگەییو؛ زوو:
*( a ~ baby; a ~ idea, proposal, etc.)*

**prematurely** (prē´mə-tyoor′li, prē´mə-choor′li), *adv.* پێش کاتی خۆی؛ زوو؛ بە نەبەکامی: *( She died ~ . )* .

**premaxilla** (prē´mak-sil′ə), *n.* ئێسکی کاژێری سەرووی بڕبڕەدارەکان.

**premedical** (prē-med′i-k'l), *adj.* خوێندنی سەرەتایی یا ئامادەیی بۆ خوێندنی پزیشکەوانی.

**premeditate** (prē-med′ə-tāt´), *v.t.* پێشەکی بیرکردنەوەو نەخشەکێشان‌و پیلان گێڕان؛ بە دەستەنقەست کردن؛ تەگبیرکردن:
*( to ~ a murder)*

*v.i.* پێشەکی بیرکردنەوە.
-premeditative *(adj.)*; **premeditator** *(n.).*

**premeditated** (prē-med′ə-tāt´id), *adj.* بە دەستەنقەست کراو؛ پێشەکی تەگبیر بۆ کراو و نەخشە بۆ کێشراو: *( a ~ murder)* .

**premeditation** (prē-med´ə-tā′shən), *n.* (١) نەخشەکێشانی پێشەکی؛ تەگبیر؛ تەگبیرکردن. (٢) دەستەنقەستی لە کردنی تاوانێکدا (یاسا).

**premier** (prē′mi-ēr, prem′yēr), *adj.* (١) یەکەم؛ گرنگترین؛ سەرەکی ترین. (٢) کۆنترین؛ دێرینترین؛ پێشترین؛ زووترین.

*n.* سەرەك وەزیران.

**première** (pri-mêr′), *n.* (١) یەکەم پیشاندانی فیلمێك یا نواندنێکی شانۆگەری. (٢) قارەمانی ژنی شانۆگەری‌یەك یا فیلمێك.

**premiership** (pri-mēr′ship, prē′mi-ēr-ship´), *n.* سەرەك

**prize fight,** بۆکسبازی بۆ پارە.
**prize fighter,** بۆکسبازێکە کە بۆکسبازی پیشەیەتی‌و بۆ پارە دەیکات.
**prize fighting,** بۆکسبازی بۆ پارە.
**prize ring,** (١) مەیدانی بۆکسبازی بۆ پارە. (٢) بۆکسبازی بۆ پارە.
**pro** (prō), *adv. & adj.* سەر بە لایەك؛ لایەنگر.
*n.* (١) کەسێکی سەر بە لایەك؛ لایەنگری مەسەلەیەکی کۆڕ لەسەر گیراو.
(٢) هۆی لایەنگری کردنی مەسەلەیەك:
*( the ~s and cons of the matter)*
(٣) دەنگێکە بۆ لایەنگری مەسەلەیەك.
**pro** (prō), *adj. & n.* [Colloq.], = **professional.**
**pro-** (prō), پێشگرێکە بەمانای: (ا) لەپێش؛ لەبەردەم.
(ب) لەپێش؛ بەر لە.
**pro-** (prō), پێشگرێکە بەمانای: (ا) بۆ پێشەوە ڕۆیشتن: *( progress)* .
(ب) لەبری؛ لەجیاتی: *( pronoun)* .
(ج) لەسەرکردنەوە؛ لەسەرهەڵدان.
(د) سەر بە؛ لایەنگریکەر: *( prolabor; pro-American)* .
**proa** (prō′ə), *n.* بەلەمێکی بایەوانی خێرایە.
**probability** (prob′ə-bil′ə-ti), *n.* (١) لەوانەبوون؛ بۆ هەبوون؛ ڕێ تێ چوون؛ شیان. (٢) شتێکی ڕێ تێ چوو؛ شتێکە کە لەوانەیە ببێ.
**in all probability,** زۆر لەوانەیە؛ زۆر ڕێی تێ دەچێ.
**probable** (prob′ə-b'l), *adj.* (١) لەوانەیە؛ ڕێی تێ دەچێ؛ بۆی هەیە ڕووبدات؛ ڕەنگە. (٢) دەشێ؛ دەگونجێ؛ بۆی هەیە بکرێ بە بەڵگە؛ شیاو: *( ~ evidence)* .
**probable cause,** هۆی بەجێ بۆ بە تاوانبار دانانی گومانبارێك (دادگەری).
**probably** (prob′ə-bli), *adv.* لەوانەیە؛ بۆی هەیە؛ دەگونجێ؛ ڕەنگە
**probang** (prō′baŋ), *n.* قوڕگ پاکەرەوە: شیشێکی نەرمی بارێکە سەرەکەی ئیسفەنج یا لۆکەی پێوەیە بۆ شت لە قوڕگ لابردن یا دەرمان کردنی بەکاردەهێنرێ.
**probate** (prō′bāt), *n.* سەلماندنی ڕاستی وەسیەتنامەی مردوویەك لە دادگادا.
*adj.* تایبەتی بە سەلماندنی درووستی وەسیەتنامەی مردوویەك لە دادگادا:
*( a ~ judge)*
*v.t.* (١) سەلماندنی درووستی وەسیەتنامەی مردوویەك لە دادگادا.
(٢) وەستاندنی سزای تاوانبارێکی مەترسی لێ نەکراو و خستنیە ژێر چاودێرییەوە لەباتی بەندیخانە.
**probate court,** دادگای سەلماندنی درووستی وەسیەتنامە (هەندێ جار دابەشکردنی زەوی‌وزارو خانو وماڵی میراتی).
**probation** (prō-bā′shən), *n.* (١) تاقیکردنەوەی لێهاتوویی کەسێك (پێش دانانی لەسەر کار). (٢) وەستاندنی سزای تاوانبارێك‌و خستنیە ژێر چاودێرییەوە لەباتی بەندیخانە.
(٣) ماوەی مۆڵەتدان بە قوتابییەك بۆ بەرزکردنەوەی نمرەکانی لەژێر چاودێریدا.
(٤) باری کەسێکە لەژێر چاودێری وەهادا.
**-probational** *(adj.)*; **probationary** *(adj.)*.
**probationer** (prō-bā′shən-ẽr), *n.* کەسێکی ژێر چاودێری (وشەی پێشوو ببینە).
**probation officer,** ئەفسەری چاودێر: فەرمانبەرێکە دادگا دایدەنێ بۆ چاودێری کردنی ئەو تاوانبارانەی سزاکەیان وەستێنراوەو بەرەڵا کراون.
**probative** (prō′bə-tiv, prob′ə-tiv), *adj.* (١) هی تاقیکردنەوە؛ تاقیکەرەوە. (٢) سەلمێنەر؛ بەڵگە پیشاندەر؛ تایبەتی بە بەڵگە پیشاندان‌و سەلماندن.
**probatory** (prō′bə-tôr′i, prō′bə-tō′ri), *adj.* = **probative.**
**probe** (prōb), *n.* (١) ئامێری پشکنین: ئامێرێکی پزیشکی بارێکی کولە بۆ پشکنینی برین‌و بۆشایی لەش. (٢) کەشتییەکی هەواییە دەهاوێژرێتە بۆشایی ئاسمان بۆ کۆکردنەوەی دەنگوباسی زانیاری لەبارەی بۆشایی دەورووپشتی زەوییەوە (پێشی دەوترێ: **space probe** ) .
(٣) لێکۆڵینەوەی وورد لە کاری چەوت‌و قەدەغە (بەتایبەتی لەلایەن کۆمیتەیەکی پەرلەمانەوە).
*v.t.* (١) پشکنینی برین (وەك گەڕان بۆ گوللەیەکی جێگیربوو لەناو لەشدا)
(٢) لێکۆڵینەوە بەووردی.
*v.i.* ( ~ **into** ). پشکنین؛ بۆ گەڕان؛ لێکۆڵینەوە.
**probity** (prō′bə-ti, prob′ə-ti), *n.* سەرڕاستی؛ بێ پێچ‌وپەنایی؛ پاکی.
**problem** (prob′ləm), *n.* (١) کێشە؛ گیروگرفت؛ دەردەسەری؛ تەنگوچەڵەمە؛ گێچەڵ؛ تەگەرە؛ ناخۆشی؛ مەسەلەی باسکراو.
(٢) کێشە (ژمارەوپێوان): *( a mathematical ~ )* .
*adj.* (١) گیروگرفتاوی؛ کێشەدار: *( a ~ novel)* .
(٢) سەرکێش؛ لاسار؛ بە ئاسانی ڕانەهاتوو: *( a ~ child)* .
**problematical** (prob′lə-mat′i-k'l), *adj.* (١) گیروگرفتاوی؛ بە ئاسانی چارەسەر ناکرێ. (٢) گوماناوی؛ ناسۆگەر؛ نەگەرونەگەری.
**proboscidian** (prō′bə-sid′i-ən), *adj.* تایبەتی بە گیاندارە لمۆزدارەکان (وەك فیل)؛ لمۆزدار.
*n.* گیانداری لمۆزدار.
**proboscis** (prō-bos′is), *n.* (١) لمۆزی فیل.
(٢) لمۆزی جانەوەر (بۆ مژین). (٣) لووتی زل (لەڕووی گاڵتەوە)
**procaine** (prō-kān′, prō′kān), *n.* پرۆکایین: ماددەیەکە لە دەرمانی بەنج دا بەکاردەهێنرێ.
**procambium** (prō-kam′bi-əm), *n.* ئەو شانانەی ڕووەکن کە شانەی دارین‌و ئاووگ بەریان لێ درووست دەبێت.
**procedural** (prə-sē′jẽr-əl, prō-sē′jẽr-əl), *adj.* تایبەتی بە پەیڕەوی جێبەجێکردنی کاروباری پەرلەمان یا دادگا یا کۆڕێك.
**procedure** (prə-sē′jẽr, prō-sē′jẽr), *n.* (١) شێوەی کردن؛ پەیڕەو؛ شێوەی جێبەجێکردنی کارێك. (٢) ڕێبازی کردنی شتێك.
(٣) شێوەو پەیڕەوی جێبەجێکردنی کاروباری پەرلەمان، دادگا یا کۆڕێك.
**proceed** (prə-sēd′, prō-sēd′), *v.i.* (١) بەردەوام بوون پاش وەستان؛ دەستپێکردنەوە: *( We then ~ed to the next town.)* .
(٢) دەستکردنەوە بە قسەکردن پاش وەستان؛ تێهەڵچوونەوە.
(٣) کردن؛ لەسەر ڕۆیشتن؛ بەردەوام بوون لەسەر؛ دەستپێکردن:
*( He ~ed to eat his dinner.)*
(٤) ( ~ **against** )، شکات لێکردن؛ دان بە دادگا.
(٥) لێوە پەیدابوون؛ لێوەهاتن.
**proceeding** (prə-sēd′iŋ, prō-sēd′iŋ), *n.* (١) بەردەوام بوون لەسەر؛ لەسەر ڕۆیشتن. (٢) کردار؛ کار. (٣) ڕێباز؛ ڕێ.
(٤) *(pl.)*، سەوداگەری؛ سەودا؛ ئاڵوویر.
(٥) *(pl.)*، تۆمارنامەی کۆڕی ڕێکخراوێکی زانستی یا هی تر.
(٦) (ا) *(pl.)*، شکات. (ب) شکات کردن.
**proceeds** (prō′sēdz), *n.pl.* داهات؛ بەرهەم (سەوداگەری، چالاکی)؛ دەسکەوتی ئاڵوویر: *( The ~ from the sale of the house will be devoted to charity.)*
**procephalic** (prō′sə-fal′ik), *adj.* هی پێشەوەی سەر؛ ناوچەوانی.
**process** (pros′es), *n.* (١) ڕێباز؛ شێوەی جێبەجێکردنی کارێك؛ پرۆسە؛ ڕەوتی کار؛ پەیڕەوی هێنانە بەرهەمی شتێك.
(٢) هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی کارێك؛ هەنگاو یا قۆناغەکانی پێدا ڕۆیشتنی کردارێك بۆ تەواوبوونی: *( the ~ of digestion)* .
(٣) کات تێپەڕبوون یا بەسەرچوون.
(٤) بەردەوامی؛ پێشکەوتن؛ بزووان.
(٥) (ا) شکات. (ب) فەرمانی دادگا بۆ بانگ کردنی گومانبار بۆ دادگا
(ج) سەرجەمی ئەم فەرمانی بانگ کردنانە دەربارەی داواکارییەك.

(٦) زیاده ئیسقان؛ زیاده گۆشت؛ ئەندام یا پارچەی ئەندامی زیادەی گیاندارو پرووەك

*v.t.* (١) بە ڕێبازێکی تایبەتیدا بردن.

(٢) ئامادەکردن بە دەستکاری کردن و گۆڕین و بردن بە چەند هەنگاوێکی تایبەتیدا؛ خۆشکردن (پێستە، خواردەمەنی): *( to ~ food)* .

(٣) شکات لێکردن؛ دان بە دادگا.

(٤) فەرمان پێکردن بۆ چوونە دادگا؛ بانگ کردن بۆ دادگا.

*adj.* . *( ~ cheese)* بەشێوەیەکی تایبەتی ئامادەکراو؛ خۆشکراو؛ ئامادەکراو:

**in (the) process of,** (١) وا دروست دەکرێ؛ لە ئامادەکردندایە.

(٢) لە کاتی.

**process** (pros′es), *v.i.* لە نمایشدا بوون؛ لە خۆپیشاندانداندا بەشداری کردن

**procession** (prə-sesh′ən, prō-sesh′ən), *n.* (١) ڕێ ڕۆیشتن؛ بۆ پێشەوە ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتنی ڕێك‌وپێك.

(٢) نمایش؛ گەلەڕەوت؛ خۆپیشاندان: *( a funeral ~ )* .

(٣) زنجیره.

*v.i.* بەشداربوونی ڕێ ڕۆیشتن.

**processional** (prə-sesh′ən-'l, prō-sesh′ən-'l), *adj.* (١)- نمایشی. (٢) تایبەت بە گۆرانی ووتن بە ئاوازەوە (خاچ پەرستی).

*n.* (١) پەڕتووکی نمایشی کڵێسە. (٢) سروودێکی ئاینی یا گۆرانییەکە لە کاتی هاتنەژوورەوەی قەشەکاندا بۆ کڵێسە لەپێش نوێژدا دەووترا.

(٣) ئاوازو مۆسیقای نمایش یا ئاهەنگێکی ئاینی... هتد.

**process server,** پۆلیسی ڕاگەیەنەری فەرمانی دادگا بەو کەسانەی کە بانگ دەکرێن بۆ دادگا (گومانبار یا شایەت).

**proclaim** (prō-klām′), *v.t.* (١) بانگ بۆ هەڵدان؛ جاڕ بۆ دان.
*( They ~ed her queen.)*

(٢) قەدەغەکردن بە بڵاونامە.

(٣) بڵاوکردنەوە؛ بانگ هەڵدان؛ جاڕدان.

(٤) نیشانەی ئەوە بوون؛ واگەیاندن؛ پیشاندان:
*( Her every act ~ed her a snob.)*

**proclamation** (prok′lə-mā′shən), *n.* (١) بڵاوکردنەوە؛ بانگ هەڵدان؛ جاڕدان. (٢) بڵاونامە (بەتایبەتی هی میری یا ڕەسمی)؛ جاڕ:
*( the ~ of independence)*

**proclivity** (prō-kliv′ə-ti), *n.* ئارەزوو (بەتایبەتی بۆ کردەوەو خووی ناپەسەند)؛ حەزی زگماکی؛ مەیلی سرووشتی: *( a ~ to vice)* .

**proconsul** (prō-kon′s'l), *n.* (١) فەرماندەی لەشکرو بەڕێوەبەری ناوچەیەکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. (٢) فەرمانڕەوای ئینگلیز لە یەکێك لە وڵاتە ژێردەستەکانی ئینگلتەرە.

**-proconsular** *(adj.).*

**proconsulate** (prō-kon′s'l-it, prō-kon′syoo-lit), *n.* ماوەی کاربەدەستی و پلەوپایەی فەرماندەی ڕۆمانی.

**procrastinate** (prō-kras′tə-nāt′), *v.i.* دواخستن؛ کەمتەرخەمی کردن؛ خستنە پشت گوێ؛ بە قنگدا خستن.

*v.t.* شت دواخستن؛ شت خستنە پشت گوێ؛ کەمتەرخەمی کردن.

**procrastination** (prō-kras′tə-nā′shən), *n.* کەمتەرخەمی؛ شت خستنە پشت گوێ؛ بە قنگدا خستن.

**procrastinator** (prō-kras′tə-nā′tēr), *n.* کەمتەرخەم؛ کار لە کاتی خۆیدا نەکەر.

**procreant** (prō′kri-ənt), *adj.* (١) منداڵی دەبێ؛ بەبەر؛ سك دەکات.

(٢) تایبەتی بە زاوزێ؛ هی سك‌وزا کردن.

**procreate** (prō′kri-āt′), *v.t.* (١) منداڵبوون؛ زاوزێ کردن؛ سك‌وزا کردن. (٢) هێنانە بەر؛ دروستکردن؛ هێنانە جیهانەوە.

*v.i.* منداڵبوون؛ زاوزێ کردن؛ سك‌وزا کردن.

**-procreator** *(n.).*

**procreation** (prō′kri-ā′shən), *n.* منداڵبوون؛ زاوزێ کردن؛ سك‌وزا کردن؛ هێنانە جیهانەوە.

**procreative** (prō′kri-ā′tiv), *adj.* (١) منداڵی دەبێ؛ بەبەر؛ سك دەکات. (٢) زاوزێیی؛ تایبەتی بە سك‌وزا کردن: *( ~ instinct)*

**procto-** (prok′tō, prok′tə), پێشگرێکە بەمانای: کۆم؛ قنگ:
*( proctology)*

**proctology** (prok-tol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی کۆم.

**proctor** (prok′tēr), *n.* چاودێر (تاقیکردنەوەی قوتابخانەو خانەی قوتابیان یا بەشی ناوخۆ).

*v.t.* *( to ~ an examination)* چاودێری کردنی تاقیکردنەوە:

**-proctorial** *(adj.)*; **proctorship** *(n.).*

**proctoscope** (prok′tə-skōp′), *n.* ئامێری تێڕوانینی کۆم (پزیشکەوانی).

**procumbent** (prō-kum′bənt), *adj.* (١) بەسەر دەمدا پاڵ کەوتوو.

(٢) تەرز فڕێدەر بەسەر زەویدا؛ بەسەر زەویدا کشان (ڕووەك).

**procurable** (prō-kyoo′rə-b'l), *adj.* بەئاسانی دەسکەوتوو.

**procuration** (prok′yoo-rā′shən), *n.* (١) بەجێهێنانی کاروباری کەسێکی تر. (٢) بریننامە؛ وەکالەتنامە.

(٣) بۆ هێنان (ئافرەتی سووك)؛ بۆ پەیداکردن.

**procurator** (prok′yoo-rā′tēr), *n.* (١) بەڕێوەبەری دارایی ناوچەیەکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی. (٢) بریکار؛ وەکیل.

**procure** (prō-kyoor′), *v.t.* (١) پەیداکردن؛ دەسکەوتن:
*( He ~d work.)*

(٢) [Rare]، بوون بە هۆ.

(٣) گەوادی بۆ کردن؛ ئافرەت بۆ هێنان.

*v.i.* گەوادی کردن؛ ئافرەت بۆ پەیداکردن یا هێنان.

**procurement** (prō-kyoor′mənt), *n.* (١) پەیداکردن؛ دەسکەوتن. (٢) ئافرەت بۆ هێنان؛ گەوادی بۆ کردن.

**procurer** (prō-kyoor′ēr), *n.* (١) پەیداکەر. (٢) گەواد.

**procuress** (prō-kyoor′is), *n.* گەواد (ژن).

**prod** (prod), *n.* (١) نەقیزە.

(٢) نەقیزە تێوەژەندن؛ تێوەژەندن؛ هان؛ پاڵ.

*v.t.* (١) نەقیزە تێوەژەندن؛ تێوەژەندن. (٢) هاندان؛ پاڵ پێوەنان.

**-prodder** *(n.).*

**prodigal** (prod′i-g'l), *adj.* (١) پارە بەفیڕۆدەر؛ پارە لەبەرددەر.

(٢) دەستبڵاو؛ بەخشندە؛ دڵ فراوان؛ بدەر. (٣) زۆروزەبەنە؛ فرە؛ مشە.

*n.* کەسێکی پارە بەفیڕۆدەر؛ کەسێکی پارە لەبەرددەر.

**prodigality** (prod′i-gal′ə-ti), *n.* (١) پارە بەفیڕۆدان؛ بەفیڕۆدان. (٢) بەخشندەیی؛ دەستبڵاوی؛ دڵ فراوانی.

(٣) زۆروزەبەنیی؛ فرەیی؛ مشەیی.

**prodigious** (prə-dij′əs), *adj.* (١) زۆر زل؛ زۆر گەورە.

(٢) نائاسایی؛ سەرسوڕمێنەر. (٣) [Obs.]، بەدووم؛ نیشانەی نەهاتە.

**prodigy** (prod′ə-ji), *n.* (١) ڕووداوێکی نائاسایی یا لە سرووشت بەدەر؛ شتێکی سەرسوڕمێنەر. (٢) کەسێکی بلیمەت (بەتایبەتی منداڵ)؛ کەسێکی هەڵکەوتوو: *( a child ~ )* .

(٣) [Archaic]، نیشانەی بەدوومی.

**prodrome** (prō′drōm), *n.* یەکەم نیشانەی نەخۆشی.

**-prodromal** *(adj.).*

**produce** (prə-dōōs′, prə-dūs′), *v.t.* (١) دەرهێنان؛ دەرخستن و پێدان بۆ سەیرکردن:
*( At the police officer's request he ~d his driver's license.)*

(٢) بەرهەم هێنان؛ بەرگرتن:
*( This field ~s wheat.; a well that ~s oil)*

(٣) دروستکردن؛ پێکهێنان.

(٤) بوون بە هۆ؛ پەیدا بوون:
*( His remarks ~d a flood of rumors.)*

(٥) ئامادەکردن و پیشاندان (فیلم، شانۆگەری)؛ دەرکردن؛ دەرهێنان:
*( to ~ a film, play, etc.)*
*v.i.* (١) بەرهەم هێنان؛ بەرگرتن. (٢) دروستکردن؛ پێکهێنان.
*n.* بەروبوومی کشتوکاڵی؛ سەوزەو میوەو دانەوێڵە (کە لە فرۆشگادا دەفرۆشرێ).

**producer** (prə-dōōs′ẽr, prə-dūs′ẽr), *n.* (١) بەرهەمهێنەر (بەروبوومی کشتوکاڵی، شتی دروستکراو... هتد).
(٢) فڕنی گازی سووتەمەنی دروستکەر (لە خەڵوز).
(٣) دەرهێنەری فیلم و شانۆگەری؛ دەرهێنەر.

**producer gas,** گازی سووتەمەنی لە خەڵوز دروستکراو.

**producer goods, producers' goods,** شتومەکی بەرهەمهێن: کەرەسەی خاو و مەکینەی بەکارهێنراو بۆ دروستکردنی فرۆتەنی.

**producible** (prə-dōōs′ə-b'l, prə-dūs′ə-b'l), *adj.* بە بەرهەم دەهێنرێ؛ پەیدا دەکرێ.

**product** (prod′əkt), *n.* (١) بەرهەم؛ بەروبووم؛ شتی دروستکراو.
(٢) ئەنجام: *( War is a ~ of greed.)* .
(٣) ماددەیەکی پەیدابوو لە ئەنجامی گۆڕانێکی کیمیاییەوە.
(٤) ئەنجامی لێکدان (ژمارەوپێوان).

**production** (prə-duk′shən), *n.* (١) هێنانە بەرهەم؛ هاتنە بەرهەم.
(٢) هێنانە بەرهەمی فرۆتەنی. (٣) بەرهەم.
(٤) سەرجەمی بەرهەم؛ سەرجەمی شتومەکی دروستکراو.
(٥) شانۆگەرییەکی پێشکەش کراو لەسەر شانۆ؛ نواندنی شانۆگەرییەک.

**productive** (prə-duk′tiv), *adj.* (١) بەپیت؛ بەبڕشت:
*( a ~ farm)*
(٢) بە بەرهەم؛ بەرهەمدار: *( a ~ week)* .
(٣) (~ of)؛ دەبێتە هۆی؛ لێ پەیدابوو: *( Waste is ~ of many evils.)* .
(٤) بەرهەمهێنەری فرۆتەنی.

**-productively** *(adv.)*; **productiveness** *(n.)*.

**productivity** (prō′duk-tiv′ə-ti), *n.* بەبەروبوومی؛ بەپیتی؛ بەبەرهەمی؛ بەبڕشتی.

**proem** (prō′em), *n.* پێشەکی یا سەرەتایەکی کورت.

**prof** (prof), *n.* = professor.

**profanation** (prof′ə-nā′shən), *n.* پیس کردن (شوێنی ئاینی و پیرۆز)

**profane** (prə-fān′, prō-fān′), *adj.* (١) نائاینی؛ جیهانی:
*( ~ history, literature, art, writer, etc.)*
(٢) کافر؛ خوانەناس؛ بێ ئاین؛ زمان پیس؛ بەدگۆ.
(٣) پیس؛ ناشرین (کردەوە، زمان): *( ~ language)* .
(٤) ناپیرۆز؛ پیرۆز نەکراو
*v.t.* (١) پیس کردن (شوێنی ئاینی و پیرۆز).
(٢) بۆ مەبەستی نزم و پیس بەکارهێنان؛ بە خراپانە بەکارهێنان؛ پیس کردن.

**-profanatory** *(adj.)*; **profanely** *(adv.)*; **profaneness** *(n.)*.

**profanity** (prə-fan′ə-ti, prō-fan′ə-ti), *n.* (١) کافری؛ بێ ئاینی. (٢) زمان پیسی؛ کفر؛ جوێن؛ بەدگۆیی.

**profess** (prə-fes′), *v.t.* (١) بەئاشکرا ووتن؛ دان پیانان؛ بانگ هەڵدان.
(٢) بە درۆ واپیشاندان؛ بە درۆ ووتن:
*( She ~ed a gratitude she did not feel.)*
(٣) پیشەگەری کردن؛ کردن: *( to ~ medicine, law, etc.)* .
(٤) بڕوا پێ هێنان بە ئاشکرا: *( to ~ Christianity, Islam, etc.)* .
(٥) وەرگرتن بە ئەندامی پەرستگا.
*v.i.* (١) بەئاشکرا ووتن؛ دان پیانان.
(٢) بوون بە ئەندامی پەرستگایەک؛ خۆ تەرخان کردن بۆ خواپەرستی.

**professed** (prə-fest′), *adj.* (١) بەئاشکرا دان پیانراو؛ بە دەمی خۆی ووتوویەتی:
*( a ~ infidel; a ~ opponent of progress)*
(٢) بە درۆ؛ هەر بەناو؛ درۆزنە: *( a ~ friend)* .
(٣) خۆ تەرخان کردوو بۆ خواپەرستی: *( a ~ man)* .

**professedly** (prə-fes′id-li), *adv.* (١) بەئاشکرا؛ بە دەمی خۆ.
(٢) بەناو؛ بە درۆ؛ بە سەرزاری؛ بە ڕوواڵەت.

**profession** (prə-fesh′ən), *n.* (١) بانگ هەڵدان بە ڕاست یا بە درۆ؛ وا ووتن؛ وا پیشاندان؛ دان پیانان: *( a ~ of faith)* .
(٢) (ا) بڕوا پێ هێنان بەئاشکرا بە ئاینێک. (ب) ئاینی بڕواپێکراو؛ بڕوا
(٣) پیشە؛ پیشەگەری؛ ئیش وکار؛ کار؛ پیشەیەکە کە پێویست بە خوێندنی بەرز بکات (وەک پزیشکەوانی، پارێزەری، ئەندازیاری، مامۆستایی... هتد).
(٤) پیشەگەرانی پیشەیەک. (٥) خۆ تەرخان کردن بۆ خواپەرستی.

**professional** (prə-fesh′ən-'l), *adj.* (١) شایستەی پیشەگەرە؛ پیشەوەر؛ تایبەتی بە پیشەگەری.
(٢) بۆ پارە کراو؛ کراو بە پیشە (نەک بۆ خۆشی): *( a ~ writer)* .
(٣) هی پیشەگەران؛ ئەوانەی مەبەستیان پارەیە نەک ڕابواردن: *( ~ sports)* .
(٤) بزان؛ شارەزای ڕشتەی خۆی؛ پیشەوەر؛ پیشەزان: *( a ~ politician)* .
*n.* (١) پیشەوەر؛ پیشەگەر.
(٢) کەسێکە کە شتی ڕابواردن دەکات بە پیشە (وەرزشکاری مووچەخۆر).
(٣) پیشەوەرێکی شارەزا یا لێهاتوو؛ کەسێکی دەستباڵا لە پیشەیەکدا.
*( a true ~ )*

**professionalism** (prə-fesh′ən-'l-iz'm), *n.* (١) پیشەگەرێتی؛ لێهاتوویی و شارەزایی لە پیشەی خۆدا؛ گیانی پیشەگەرێتی؛ بە جوانی و ڕێکوپێکی و ووردی و لێهاتوویی ئیش وکاری خۆ کردن:
*( He impressed me with his ~ .)*
(٢) بەکارهێنانی وەرزشکاری مووچەخۆر لە وەرزشدا؛ کردنی شتێک بە پیشەو بۆ پارە کە بەناو هەر بۆ ڕابواردن دەکرێ.

**professor** (prə-fes′ẽr), *n.* (١) بانگ هەڵدەر بۆ هەست و ئەست و بیروباوەڕی خۆ. (٢) مامۆستای زانکۆ یا دانشگا؛ پرۆفیسۆر.

**professorate** (prə-fes′ẽr-it), *n.* پلەوپایەو ماوەی کارکردنی مامۆستا؛ مامۆستایەتی زانکۆ.

**professorial** (prō′fə-sôr′i-əl, prof′ə-sō′ri-əl), *adj.* تایبەت یا شایستە بە مامۆستای زانکۆ؛ مامۆستایی؛ مامۆستایانە؛ لە مامۆستا چوو
*( his ~ demeanor)*

**professorship** (prə-fes′ẽr-ship′), *n.* پلەوپایەی مامۆستای زانکۆ؛ مامۆستایەتی؛ ئەرک و کاری پرۆفیسۆر.

**proffer** (prof′ẽr), *v.t.* پێشکەش کردن: *( to ~ friendship)* .
*n.* پێشکەش؛ شتی پێشکەش کراو.

**proficiency** (prə-fish′ən-si), *n.* شارەزایی؛ کارامەیی؛ زانین:
*( ~ in English)*

**proficient** (prə-fish′ənt), *adj.* شارەزا؛ کارامە؛ بزان:
*( He is ~ in driving a car, two foreign languages, etc.)*
*n.* کەسێکی شارەزا یا کارامە.

**profile** (prō′fil), *n.* (١) لایەکی دەموچاو؛ لاڕوو.
(٢) وێنەی لایەکی دەموچاو.
(٣) چێوە؛ چوارچێوەی شێوەیەک: *( the ~ of a distant hill)* .
(٤) کورتەی ژیان؛ پوختەی ژیاننامە؛ وێنەی ڕوونکردنەوەی ژیان.
*v.t.* (١) وێنەی لایەکی دەموچاو کێشان.
(٢) پوختەی ژیاننامە نووسین؛ نووسینی کورتەی ژیانی کەسێک.

**profit** (prof′it), *n.* (١) سوود؛ کەڵک؛ بەروبووم. (٢) قازانج.
*v.i.* (١) بەسوود بوون؛ بەکەڵک بوون.
(٢) سوود لێ وەرگرتن؛ قازانج لێکردن.
*v.t.* سوود پێ گەیاندن؛ قازانج پێ گەیاندن: *( It ~ed him nothing.)* .

**profitable** (prof′it-ə-b'l), *adj.* بەسوود؛ بەکەڵک؛ سوودبەخش:
*( a ~ business; ~ advice)*

**-profitability; profitableness** *(n.)*.

**profitably** (prof′it-ə-bli), *adv.* بەشێوەیەک کە سوودی لێ

وەربگیری

**profit and loss,** لێکدانەوەی قازانج و زیان (دەفتەرگری).

**profiteer** (prof´ə-têr′), ***n.*** بازرگانی گرانجان و هەلپەرست: کەسێکە
کە شت بە قازانجێکی ناڕەوا دەفرۆشێت لەکاتی گرانی یا جەنگدا.

***v.i.*** قازانجی ناڕەوا کردن بە شت بە گران فرۆشتن لەکاتی کەمی شت یا جەنگدا.

**profit-sharing** (prof′it-shâr´iŋ), ***adj.*** هاوبەشی قازانج.

**profit sharing,** هاوبەشی کردنی قازانج.

**profligacy** (prof′lə-gə-si), ***n.*** (١) سەرسەرێتی؛ داوێن پیسی؛
بێ ئابڕوویی. (٢) پارە لەبەردان؛ شت بەفیڕۆدان.

**profligate** (prof′lə-git), ***adj.*** (١) سەرسەری؛ داوێن پیس؛
بەدڕەووشت؛ بێ ئابڕوو (٢) پارە لەبەردەر؛ شت بەفیڕۆدەر.

***n.*** کەسێکی سەرسەری و داوێن پیس؛ کەسێکی پارە بەفیڕۆدەر.

**profluent** (prof′lo͞o-ənt), ***adj.*** زۆری لەبەر دەڕوات؛
پڕو ڕەوان (ڕووبار)

**pro forma** (prō fôr′mə), [L.]. (١) هەر بۆ ناو کراو یا ووتراو؛
ڕووکەش؛ ڕۆتینی؛ کلێشەیی: ***( a ~ reply)*** .

(٢) پێشەکی نێرراو بۆ کڕیار بۆ ڕێکوپێکی (بارنامە): ***( a ~ invoice)*** .

**profound** (prə-found′), ***adj.*** (١) قووڵ

(٢) پڕ مانا؛ بەمانا؛ قووڵ: ***( ~ ideas)***

(٣) نێجگار زۆر؛ زۆر؛ قووڵ: ***( ~ differences, changes, etc.)*** .

(٤) لە ناخەوە؛ توندوتیژ: ***( ~ grief, sorrow, etc.)*** .

(٥) تەواو؛ نێجگار زۆر: ***( a ~ silence)***

***n.*** [Poetic], (١) قووڵایی بێ بن (وەك بنی دەریا)؛ چاڵی بێ بن.

(٢) شتێکی قووڵ یا پڕ مانا.

**profoundly** (prə-found′li), ***adv.*** لە ناخی دڵەوە؛ نێجگار زۆر:
***( I am ~ grateful to you.)***

**profundity** (prə-fun′də-ti), ***n.*** (١) قووڵی؛ قووڵایی.

(٢) پڕ مانایی؛ قووڵی. ***( the ~ of his ideas)*** .

(٣) قووڵایی بێ بن؛ چاڵی بێ بن.

**profuse** (prə-fūs′), ***adj.*** (١) زۆروزەبەنە؛ فرە؛ مشە.

(٢) ( in ~ ). لە ڕادە بەدەر بەخشندە یا دڵ فراوان؛ بەخشندە:
***( She was ~ in her compliments.)***

**-profuseness *(n.).***

**profusely** (prə-fūs′li), ***adv.*** نێجگار زۆر:
***( He was bleeding ~ .)***

**profusion** (prə-fū′zhən), ***n.*** (١) دەستبڵاوی؛ بەفیڕۆدان.

(٢) زۆروزەبەنەیی؛ فرەیی.

**progenitor** (prō-jen′ə-têr), ***n.*** باپیر؛ باپیرەگەورە؛ باوباپیر.

**progeny** (proj′ə-ni), ***n.*** نەوە؛ وەچە؛ نەتەوە.

**proglottid** (prō-glot′id), ***n.*** هەر یەکێك لە بەشەکانی کرمی
شریتێیە کە ئەندامی نێرومێی خۆیی تێدایەو دەتوانێ ببێتە زیندەوەرێکی
سەربەخۆ

**proglottis** (prō-glot′is), ***n.*** = **proglottid.**

**prognathous** (prog′nə-thəs), ***adj. Also*** **prognathic.** کاژێر
دەرپۆقیو

**-prognathism *(n.).***

**prognosis** (prog-nō′sis), ***n.*** (١) پێشبینی ماوەی خایاندنی
نەخۆشییەك و چاکبوونەوەی نەخۆشەکە. (٢) پێشبینی.

**prognostic** (prog-nos′tik), ***n.*** (١) نیشانەی دواڕۆژ.

(٢) پێشبینی. (٣) نیشانەیەکە ماوەی خایاندنی نەخۆشییەك دەردەخات.

***adj.*** (١) تایبەتی بە پێشبینی. (٢) تایبەتی بە پێشبینی کردنی ماوەی
خایاندنی نەخۆشییەك و چاکبوونەوەی نەخۆشەکە.

**prognosticate** (prog-nos′tə-kāt´), ***v.t.*** (١) پێشبینی کردن.

(٢) نیشانەی ئەوە بوون بۆ دواڕۆژ؛ واگەیاندن دەربارەی دواڕۆژ.

**-prognostication *(n.)*; prognosticator *(n.).***

**program, programme** (prō′gram), ***n.*** (١) بەرنامە؛ نەخشە؛
ڕێباز؛ دەستوور. (٢) (أ) بەرنامەی ئاهەنگ، کۆڕ، یا پیشاندانێك.

(ب) ئەم ئاهەنگ، کۆڕ، یا پیشاندانە خۆی.

(٣) بەرنامەی رادیۆ و تەلەفزیۆن. (٤) بەرنامەی پێژمێر یا کۆمپیوتەر.

***v.t.*** (١) خستنە ناو بەرنامەوە. (٢) بەرنامە بۆ دانان؛ نەخشەکێشان.

(٢) پرۆگرام کردنی پێژمێر؛ بەرنامە دانان بۆ کۆمپیوتەر:
***( to ~ a computer)***

**programmer, programer** (prō′gram-ẽr), ***n.*** (١) بەرنامە
ئامادەکەری پێژمێر؛ پرۆگرام دانەری کۆمپیوتەر. (٢) بەرنامە ئامادەکەر.

**program music,** مۆسیقایەکە دیمەنی تایبەتی دێنێتە بەرچاوی
گوێگر.

**progress** (prog′res, prō′gres), ***n.*** (١) [Archaic] گەشت؛
گەشتی پاشایی. (٢) پێشکەوتن؛ پەرەسەندن؛ گەشەکردن.

***v.i.*** پێشکەوتن؛ پەرەسەندن؛ گەشەکردن.

in progress, بەردەوامە؛ لە ڕوودان یا کردندایە؛
دەستی پێکردووەو بەردەوامە:
***( Work is now in progress on the project.)***

**progression** (prə-gresh′ən), ***n.*** (١) پێشکەوتن.

(٢) زنجیرە (ڕوودان)؛ ڕیز؛ ڕوودانی یەك لەدوای یەك.

(٣) یەك بەدوای یەکی ژمارەیی (ژمارەوپێوان).

**-progressional *(adj.).***

**progressive** (prə-gres′iv), ***adj.*** (١) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتوو.

(٢) بەرە بەرەو هەنگاو بە هەنگاو بۆ پێشەوە چوون.

(٣) پێشکەوتنخواز.

(٤) [P-]، ئەندامی حیزبی پێشکەوتنخواز.

(٥) هەمیشە لە پێشکەوتندایە: ***( a ~ people)*** .

(٦) نیشانەی کرداری بەردەوامەو بە ( ing - ) پیشان دەدرێ (ڕێزمان)
***( present ~ tense)***

(٧) لە پەرەسەندندایە (نەخۆشی): ***( a ~ disease)*** .

(٨) بەرەو ژوور (باج): تایبەتی بە باجێك کە هەتا بێت ڕێژەکەی زیاد دەکات
بە زیادبوونی دەسکەوت: ***( a ~ tax)*** .

***n.*** (١) کەسێکی پێشکەوتنخواز. (٢) [P-] ئەندامی حیزبی پێشکەوتنخواز.

**-progressiveness *(n.).***

**progressively** (prə-gres′iv-li), ***adv.*** بەرەبەرە زیاد دەکات؛
هەمیشە هەر لە پەرەسەندندایە: ***( His disease is getting ~ worse.)***

**progressivism** (prə-gres′iv-iz′m), ***n.*** پێشکەوتنخوازی؛
بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازان.

**prohibit** (prō-hib′it, prə-hib′it), ***v.t.*** (١) قەدەغەکردن بە یاسا؛
یاساغ کردن. (٢) ڕێ لێگرتن؛ نەهێشتن.

**prohibition** (prō´ə-bish′ən), ***n.*** (١) قەدەغەکردن بە یاسا؛
یاساغ کردن؛ قەدەغەکران. (٢) یاسای ئەم قەدەغە کردنە.

(٣) (أ) قەدەغەکردنی دروستکردن و فرۆشتنی خواردنەوەی کحول.

(ب) [P-]، ئەم قەدەغەکردنە لە ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٢٠–١٩٣٣ .

**prohibitionist** (prō´ə-bish′ən-ist), ***n.*** (١) لایەنگری قەدەغە
کردنی خواردنەوەی کحول. (٢) [P-]، ئەندامی حیزبی قەدەغەکردنی
خواردنەوەی کحول لە ئەمەریکا.

**prohibitive** (prō-hib′ə-tiv, prə-hib′ə-tiv), ***adj.*** (١) ڕێگر؛
قەدەغەکەر؛ قەدەغەکەری (باجی زۆری سەر شتێك بۆ ئەوەی خەڵك نەیکڕێ):
***( ~ taxes)***

(٢) گران: ***( ~ prices)*** .

**prohibitory** (prō-hib′ə-tôr´i, prə-hib′ə-tō´ri), ***adj.*** =
**prohibitive.**

**project** (proj′ekt, proj′ikt), ***n.*** (١) نەخشە؛ پلان. (٢) پرۆژە.

***v.t.*** (١) نەخشەکێشان؛ پلان دانان؛ پێشنیازکردن.

(٢) هاویشتن؛ فڕێدان.

(٣) هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بە خەیاڵ خۆ خستنە شوێنێکەوە:
*(P~ yourselves into the world of tomorrow.)*
(٤) دەرپۆقاندن؛ دەرپەڕاندن.
(٥) شەوق هاویشتنە سەر؛ پیشاندان (بە شەوق هاویشتنە سەر):
*(to ~ an image on the screen)*
(٦) بیر یا هەستێکی خۆ لە خۆ دوورخستنەوە (دەروونناسی).
*v.i.* دەرپۆقین؛ دەرپەڕین؛ سەر دەرهێنان.
**projectile** (prə-jek'tʼl), *n.* (١) گوللە؛ مووشەك؛ فیشەکە شێتە.
(٢) شتی هاوێژراو؛ شتی فڕێدراو.
*adj.* (١) بۆ هاویشتنە؛ دەهاوێژرێ: *(A javelin is a ~ weapon.)*.
(٢) پاڵ پێوەنەر بۆ پێشەوە؛ هاوێژەر: *(~ energy)*.
**projection** (prə-jek'shən), *n.* (١) هاویشتن؛ فڕێدان.
(٢) دەرپۆقین؛ دەرپەڕین؛ سەر دەرهێنان.
(٣) شتی دەرپۆقیو: چوکڵە؛ نووك، زمانە، قۆرت، لووتکە.
(٤) (ا) پیشاندانی وێنەو فیلم (بە شەوق هاویشتنە سەر).
(ب) وێنەو فیلمی وەها پیشاندراو.
(٥) نەخشەی پێشبینی دواڕۆژ؛ گۆترەکاری:
*(These figures are only a ~ of next year's budget.)*
(٦) هەست و نەست و حەزو بیروڕای خۆ دانە پاڵ خەڵك (دەروونناسی)؛ هەستی باش و خراپی خۆ دان بەسەر خەڵکدا.
**projectionist** (prə-jek'shən-ist), *n.* (١) کارگەری مەکینەی سینەما. (٢) نەخشە دروستکەر.
**projector** (prə-jek'tēr), *n.* مەکینەی سینەما؛ شەوق هاوێژ (بۆ پیشاندانی وێنەی تاك تاك یا فیلم لەسەر پەردە)؛ ئامێری پیشاندان:
*(a motion-picture ~)*
**prolan** (prō'lan), *n.* پرۆلان. هۆرمۆنێکە لە میزی ئافرەتی سکپڕدا هەیە
**prolapse** (prō-laps'), *n.* شۆڕبوونەوە یا لە جێی خۆ ترازانی ئەندامی ناوەوەی لەش (وەك مندالْدان).
*v.i.* شۆڕبوونەوە؛ لە جێی خۆ ترازان؛ لە جێ چوون.
**prolate** (prō'lāt, prō-lāt'), *adj.* جەمسەر درێژکۆلە.
**proleg** (prō'leg´), *n.* پەلی ئەستوورو کورتی ژێر سکی هەندێ کرمۆکە.
**prolegomenon** (prō´li-gom'ə-non), *n.* سەرەتای پەڕتووك؛ پێشەکی
**prolepsis** (prō-lep'sis), *n.* (١) چاوەڕوان کردنی پەلپەو دەستپێشکەری کردن لە بەرپەرچدانەوەیدا؛ بەرپەرچدانەوەی پەلپێك پێش ئەوەی پەلپگرەکە دەم بکاتەوە. (٢) باسکردنی ڕووداوێکی چاوەڕوان کراو هەر وەکو پێشەکی ڕووی دابێت.
**-proleptic** *(adj.)*.
**proletarian** (prō´lə-târ'i-ən), *n.* پرۆلیتاری؛ تایبەتی بە چینی کرێکار؛ تایبەتی بە کرێکار.
*n.* پرۆلیتاری؛ کرێکار.
**proletariat** (prō´lə-târ'i-ət), *n.* (١) نزمترین چینی کۆمەڵی ڕۆمای کۆن؛ چینی ڕەش و ڕووت. (٢) چینی کرێکار؛ پرۆلیتاریا.
**proletary** (prō'lə-ter´i), *n.* ئەندامی چینی ڕەش و ڕووتی ڕۆمای کۆن
**prolicide** (prō'lə-sīd'), *n.* منداڵی خۆ کوشتن (پێش یا پاش لەدایکبوون).
**proliferate** (prō-lif'ə-rāt´), *v.t.* پەرە پێ سەندن.
*v.i.* (١) زۆر پەرەسەندن؛ بە هەموو لایەکدا تەرز فڕێدان: *(~ing cells)*.
(٢) زۆر تەشەنەکردن؛ بڵاوبوونەوە؛ زۆربوون.
**proliferation** (prō-lif´ə-rā'shən), *n.* تەرز فڕێدان؛ زاوزێ؛ بە هەموو لایەکدا بڵاوبوونەوە؛ تەشەنەکردن:
*(the ~ of nuclear weapons)*
**proliferous** (prō-lif'ēr-əs), *adj.* (١) زۆربوو بە گۆیکە کردن و تەرز فڕێدان و پەل هاویشتن (ڕووەکناسی، زیندەوەرزانی).
(٢) زۆر گۆیکەکەر؛ زۆر تەرز فڕێدەر.
**prolific** (prə-lif'ik), *adj.* (١) بەپیت؛ بەبڕشت؛ بەبەر؛ زۆر زاوزێکەر؛ زۆر بە وەجاخ. (٢) زۆر بە بەرهەم: *(a ~ writer, poet, etc.)*.
**prolificacy** (prə-lif'i-kə-si), *n.* بەپیتی؛ بەبڕشتی؛ زۆر بەبەری؛ زۆر بەبەرهەمی.
**proline** (prō'lēn, prō'lin), *n.* پرۆلین: ترشێکی ئەمینییە لە پرۆتیندا هەیە.
**prolix** (prō-liks', prō'liks), *adj.* (١) زۆرویژ؛ درێژدادڕ؛ دوورودرێژو ووشك (نووسراو). (٢) حەزکەر لە زۆرویژی.
**-prolixity** *(n.)*.
**prolocutor** (prō-lok'yoo-tēr), *n.* (١) دەم ڕاستی دەستەیەك، حیزبێك، یا کەسێك؛ قسەکەر بەناوی لایەکی ترەوە. (٢) کۆڕگێر.
**prologue** (prō'lôg, prō'log), *n.* (١) سەرەتای هۆنراوە یا شانۆگەری؛ سەرووتار؛ کورتە ووتارێکە ئەکتەر لە سەرەتای شانۆگەرییەکەدا پێشکەشی دەکات. (٢) خوێنەرەوەی سەرووتار.
(٣) کاری سەرەتایی (کە نیشانەی کاری دوایی ترە)؛ ڕووداوی پێشەکی.
**prologuize** (prō'lô-gīz´), *v.i.* سەرووتار خوێندنەوە.
**prolong** (prə-lôŋ'), *v.t.* درێژەپێدان؛ درێژکردنەوە؛ زۆر پێ خایاندن
**prolongate** (prə-lôŋ'gāt), *v.t.* = **prolong.**
**prolongation** (prō´lôŋ-gā'shən), *n.* (١) درێژەپێدان؛ درێژکردنەوە. (٢) بەشی خراوەسەر؛ بەشی زیادکراو.
**prolusion** (prō-lōō'zhən, prō-lū'zhən), *n.* (١) تاقیکردنەوەی سەرەتایی. (٢) ووتاری سەرەتایی؛ کورتە ووتارێکی پێشەکی بۆ ووتارێکی دوورودرێژ.
**prolusory** (prō-lōō'sə-ri, prō-lū'sə-ri), *adj.* سەرەتایی؛ هی سەرەتا یا پێشەکی.
**prom** (prom), *n.* [Colloq.], ئاهەنگی سەمای دەرچووانی قوتابخانەی ناوەندی.
**promenade** (prom'ə-nād´, prom'ə-nād'), *n.* (١) پیاسە؛ پیاسەی خۆنوواندن. (٢) جێی پیاسەکردن؛ شەقامی گشتی پیاسەکردن.
(٣) (ا) ئاهەنگی سەما. (ب) بە ڕیز هاتنەژوورەوەی بەشدارانی ئاهەنگی سەما لە سەرەتای ئاهەنگەکەدا.
*v.i.* پیاسەکردن.
*v.t.* (١) پیاسەکردن. (٢) خۆنوواندن بە ڕەوت یا پیاسە.
**promenade deck,** جێی پیاسەکردنی سەر کەشتی.
**Promethean** (prə-mē'thi-ən), *adj.* (١) پرۆمیسی (ووشەی دوایی ببینە). (٢) داهێنەر؛ ژیانبەخش؛ خاوەنی بیری ڕەسەن.
*n.* کەسێکی ژیانبەخش؛ داهێنەر؛ خاوەنی بیری ڕەسەن.
**Prometheus** (prə-mē'thūs, prə-mē'thi-əs), *n.* خودای ئاگردز لە ئاسمان و بە مرۆڤ بەخش (ئەفسانەی یۆنانی).
**promethium** (prō-mē'thi-əm), *n.* پرۆمیسیۆم: توخمێکی کیمیاگەری کانزاییە.
**prominence** (prom'ə-nəns), *n.* (١) ناوبانگ؛ ناوداری.
(٢) دەرپەڕین؛ دەرپۆقین. (٣) شتی دەرپۆقیو یا دەرپەڕیو؛ نووك؛ چوکڵە
**prominency** (prom'ə-nən-si), *n.* = **prominence.**
**prominent** (prom'ə-nənt), *adj.* (١) دەرپەڕیو؛ دەرپۆقیو:
*(a ~ nose, chin, eye, etc.)*
(٢) زۆر لەبەرچاو؛ بەدەرەوە؛ دیار.
(٣) بەناوبانگ؛ ناودار؛ ناسراو.
**promiscuity** (prom´is-kū'ə-ti), *n.* (١) بەرەڵایی جووت بوون؛ پاك و پیس نەکردن لە جووت بووندا. (٢) هەڕەمە؛ شتی هەمەجۆر
**promiscuous** (prə-mis'kū-əs), *adj.* (١) هەڕەمە؛ هەمەجۆرە.
(٢) بەرەڵای جووت بوون؛ پاك و پیس نەکەری جووت بوون.

(٢) [Colloq.]، لامسەرلایی.
-**promiscuously** *(adv.)*; **promiscuousness** *(n.)*.
**promise** (prom′is), *n.* (١) بەڵێن؛ پەیمان؛ گفت
(٢) هیوای داواڕۆژ؛ خۆش هیوایی؛ هیوای بەهات. ***( a writer of ~ )*** .
(٣) شتی بەڵێن پێدراو.
*v.i.* (١) بەڵێندان؛ پەیماندان؛ گفتدان
(٢) نیشانەی ئەوە بوون؛ هیوا لێکران.
*v.t.* (١) بەڵێن پێدان؛ گفت پێدان (٢) بەتەماکردن.
(٣) پەیمان پێدان (شووکردن)؛ دیاریکردن.
(٤) نیشانەی ئەوە بوون؛ هیوا لێکران ***( The clouds ~ rain.)*** .
**Promised Land,** (١) خاکی بەڵێندراو بە جوولەکە (ئینجیل).
(٢) [p- l-]، خاکی خێروخۆشی؛ بەهەشت.
**promisee** (prom′is-ē′), *n.* بەڵێن پێدراو
**promiser** (prom′is-ẽr), *n.* بەڵێندەر.
**promising** (prom′is-iŋ), *adj.* هیوای سەرکەوتن لێکراو؛
ئومێد لێکراو ***( a ~ pupil)*** .
**promissory** (prom′ə-sôr′i, prom′ə-sō′ri), *adj.* پەیمانی.
**promissory note,** کۆمپیالە؛ قەرزنامە.
**promontory** (prom′ən-tôr′i, prom′ən-tō′ri), *n.* (١) لێژگەی
زەوی درێژبووەوە بۆ ناو دەریا یا دەریاچە.
(٢) ئەندامی دەرپۆقیو یا دەرپەڕیوی لەش.
**promote** (prə-mōt′), *v.t.* (١) پێشخستن؛
پایە بلندکردن ***( He was ~d to colonel.)*** .
(٢) پەرەپێدان؛ گەشەپێکردن
(٣) برەوپێدان ***( to ~ a new law)***
(٤) دەرچوواندن بۆ پۆلێکی بەرزتر.
**promoter** (prə-mōt′ẽr), *n.* (١) برەوپێدەر؛ پێشخەر؛ لایەنگر
(٢) پروپاگەندەچی؛ جاڕدەر:
***( the ~ of a boxing match, beauty product, philosophy, etc.)***
**promotion** (prə-mō′shən), *n.* (١) پلە پێدان؛ پێشخستن؛
پایە بەرزکردنەوە. (٢) برەوپێدان؛ پروپاگەندە کردن بۆ فرۆتەنی‌یەك یا
بازرگانی‌یەك؛ ئەم پروپاگەندەیە.
-**promotional** *(adj.)*; **promotive** *(adj.)*.
**prompt** (prompt), *adj.* (١) ئامادە (بۆ کار)؛ خێرا (بۆ کردنی شتێك):
***( men ~ to obey, volunteer, etc.)***
(٢) یەکسەر کراو؛ دوانەکەوتوو؛ زوو: ***( a ~ reply)***
*n.* (١) (ا) مۆڵەتی قەرزدانەوە. (ب) پەیمانی قەرزدانەوە لە کاتێکی تایبەتیدا.
(٢) بیرخەرەوەی قەرزدانەوە؛ نامەی بیرخەرەوە
(٣) (ا) بیرخەرەوەی ئەکتەر لەسەر شانۆ. (ب) شتی بیرخراوەی ئەکتەر.
*v.t.* (١) هاندان؛ پاڵ پێوەنان (٢) والێکردن. (٣) بیرخستنەوە.
(٤) بیرخستنەوەی ئەکتەر لە پەنا پەردەی شانۆوە.
**promptbook** (prompt′book′), *n.* پەرتووکی بیرخەرەوە:
بریتی‌یە لە دەقی شانۆگەری‌یەك کە کەسێك بەکاری دێنێ بۆ بیرخستنەوەی
ئەکتەر
**prompter** (promp′tẽr), *n.* (١) هاندەر؛ بیرخەرەوە.
(٢) بیرخەرەوەی ئەکتەر لەسەر شانۆ.
**promptitude** (promp′tə-to͞od′, promp′tə-tūd′), *n.* (١)-
ئامادەیی (بۆ کردنی کارێك)؛ خێرایی
(٢) شت لە کاتی خۆیدا کردن؛ دوانەکەوتن.
**promptly** (prompt′li), *adv.* یەکسەر؛ بێ دواکەوتن.
**prompt note,** نامەی بیرخستنەوەی قەرزار.
(پێشی دەوروتری: " **prompt** " ).
**promulgate** (prō-mul′gāt, prom′əl-gāt′), *v.t.* (١) بانگ بۆ
هەڵدان (فەرمان، یاسا)؛ بڵاوکردنەوە: ***( to ~ a decree)*** .
(٢) خستنەکاری یاسایەك بە بڵاوکردنەوەی؛ دەرکردن (یاسا).

(٣) بڵاوکردنەوە؛ پەرە پێ سەندن: ***( to ~ learning and culture)*** .
-**promulgator** *(n.)*.
**promulgation** (prō′mul-gā′shən), *n.* بڵاوکردنەوە (یاسا،
فەرمان، زانیاری... هتد).
**pronate** (prō′nāt), *v.t.* (١) ڕوو وەرگێڕان بەرەو خوار.
(٢) بەری لەپ ڕاگرتن بۆ خوارەوە.
*v.i.* چەمینەوە؛ نوشتانەوە.
-**pronation** *(n.)*.
**pronator** (prō-nā′tẽr), *n.* باسکە ماسولکەی بەری لەپ بۆ خوارەوە
ڕاگر.
**prone** (prōn), *adj.* (١) چەماوە؛ نوشتاوە.
(٢) بە دەمدا ڕاکشاو؛ بە دەمدا کەوتوو یا پاڵ کەوتوو:
***( ~ on the ground)***
(٣) ( **to** ~ )، مەیلدار؛ بە سرووشت وەهایە؛ زۆر بۆی هەیە:
***( ~ to anger, error, mischief, etc.)***
**prong** (prôŋ), *n.* (١) پەل چنگاڵ؛ نووکی چنگاڵی خواردن یا مەکینە؛
پەل سیلك. (٢) نووك؛ چووکلە. (٣) سیلك؛ شەن.
(٤) پەل شاخی ئاسك.
*v.t.* (١) چنگاڵ لێدان؛ چنگاڵ پیاکردن.
(٢) زەوی کێڵان بە چنگاڵی مەکینە. (٣) بە سیلك هەڵگرتن.
**pronged** (prôŋd), *adj.* پەلدار؛ چنگدار: ***( a three- ~ fork)*** .
**pronghorn** (prôŋ′hôrn′), *n.* ئاسکی شاخ پەل پەل.
**pronominal** (prō-nom′ə-n′l), *adj.* تایبەت بە ڕاناو (ڕێزمان).
**pronoun** (prō′noun), *n.* ڕاناو (ڕێزمان):
**( I, me, you, he, she, it, they)**
**pronounce** (prə-nouns′), *v.t.* (١) دەرکردن؛ بڵاوکردنەوە؛ دەربڕین:
***( The judge ~d the sentence.)***
(٢) بڵاوکردنەوەی باروودۆخی کەسێك یا شتێك:
***( He was ~d dead on arrival.)***
(٣) ووتن؛ بێژان: ***( She couldn't ~ my name.)*** .
*v.i.* (١) ( **on** ~ )، بڕیار دەرکردن. (٢) بێژان (زمانەوانی)؛ ووتن.
**pronounced** (prə-nounst′), *adj.* (١) بێژراو؛ ووتراو.
(٢) دیار؛ زۆر دیار؛ ئاشکرا: ***( a ~ accent)*** .
**pronouncement** (prə-nouns′mənt), *n.* (١) بڵاونامەی ڕەسمی.
(٢) بڕیاری ڕەسمی؛ بڕیار؛ ڕا.
**pronto** (pron′tō), *adv.* [Slang], یەکسەری؛ بەخێرایی.
**pronunciamento** (prə-nun′si-ə-men′tō), *n.* (١) بڵاونامەی
ڕەسمی. (٢) بڵاونامەی یاخی بووان بە ڕووخاندنی میری.
**pronunciation** (prə-nun′si-ā′shən), *n.* (١) (ا) بێژان-
(زمانەوانی)؛ ووتن. (ب) شێوەی بێژان یا ووتن.
(٢) نووسینی ووشە بەشێوەی بێژانی یا ووتنی.
**proof** (pro͞of), *n.* (١) چەسپاندن؛ سەلماندن؛ ساغ کردنەوە.
(٢) بەڵگە؛ نیشانە. (٣) تاقیکردنەوە. (٤) تاقیکراوە؛ دەرچوون.
(٥) قایمی؛ هێزی تاقیکراوە. (٦) تیژی یا خەستی خواردنەوەی کحولی.
(٧) پەراوە (چاپەمەنی، وێنەگری، هەڵکەندن).
(٨) بەڵگە (دادگەری).
*adj.* (١) کارتێنەکراو؛ بەرهەڵستیکەر؛ خۆڕاگر: ***( ~ against criticism)*** .
(٢) تاقیکەرەوەیی.
(٣) خەستی‌یەکەی ئاسایی‌یە (خواردنەوەی کحولی).
**-proof** (pro͞of), پاشگرێکە بەمانای: (ا) – بڕ: ***( waterproof)*** .
(ب) دژ بە؛ پارێزراو لە: ***( foolproof; weatherproof)*** .
(ج) بەهێز یا قایم وەك: ***( armorproof)*** .
(د) کارتێنەکردوو: ***( pityproof)*** .
**proofread** (pro͞of′rēd′), *v.t. & v.i.* هەڵەبڕکردن؛
پوختەکردن (نووسراو، پەرتووك).

**-proofreader** ***(n.).***
**proof spirit,** خواردنەوەی نیوە کحولی (لە ٥٠٪ ی کحولی پوختە).
**prop** (prop), ***n.*** (١) کۆڵەکە؛ پاڵپشت؛ پایە؛ لەنگەر.
(٢) کەرەسەو حل‌وبەرگ‌و شتومەکی بەکارهێنراو بۆ دەرهێنانی فیلم یا شانۆگەری.
***v.t.*** (١) ( ~ up ). لەنگەرگرتن؛ پاڵپشت گرتن؛ دانەپاڵ.
(٢) ( ~ against )، هەڵپەساردن.
(٣) ڕاگیرکردن؛ پاڵپشتی کردن: ***( to ~ an unpopular regime)*** .
**propaedeutic** (prō´pi-dū′tik), ***adj.*** سەرەتایی (خوێندن، فێرکردن)
***n.*** باسێکی سەرەتایی؛ خوێندن یا فێرکردنی سەرەتایی.
**propaedeutics** (prō´pi-dū′tiks), ***n.pl.*** زانیاری و پەیرەوی سەرەتایی یا بنچینەیی.
**propagable** (prop′ə-gə-b'l), ***adj.*** (١) بڵاودەکرێتەوە (بیروباوەڕ)
(٢) پەرەی پێ دەسەنرێ؛ زۆر دەکرێ (لەڕێی زاوزێوە).
**propaganda** (prop´ə-gan′də), ***n.*** (١) [P-] . ئەنجوومەنی ئاین بڵاوکردنەوە (کە لە سەرەك قەشە کاسۆلیکییەکان پێکدێت).
(٢) دەستەی پڕوپاگەندە؛ دەستەی بڵاوکەرەوەی بیروباوەڕێك یا ڕێبازێك.
(٣) پڕوپاگەندە؛ بەندوباو.
**propagandist** (prop´ə-gan′dist), ***n.*** پڕوپاگەندەچی؛ بەندوبارخەرەوە
***adj.*** پڕوپاگەندەیی
**propagandize** (prop´ə-gan′dīz), ***v.t.*** (١) پڕوپاگەندە بۆ کردن؛ بڵاوکردنەوەی بیروڕایەك بە پڕوپاگەندە بۆ کردن.
(٢) پڕوپاگەندە ئاراستەکردن.
***v.i.*** پڕوپاگەندەکردن؛ بەندوباوخستنەوە.
**propagate** (prop′ə-gāt´), ***v.t.*** (١) زاوزێ پێکردن؛ لەیەك چاك کردن‌و پەروەردەکردن (گیاندار، ڕووەك).
(٢) زاوزێ کردن؛ زۆربوون؛ پەرەسەندن.
(٣) تایبەخۆدان بە نەوە یا وەچە لەڕێی زاوزێوە.
(٤) بڵاوکردنەوە (بیروباوەڕ، دەنگوباس): ***( to ~ news, ideas, etc.)*** .
(٥) گەیاندن: ***( to ~ heat)*** .
***v.i.*** زاوزێ کردن؛ زۆربوون؛ پەرەسەندن.
**-propagator** ***(n.).***
**propagation** (prop´ə-gā′shən), ***n.*** (١) زاوزێ؛ زۆربوون؛ پەرەسەندن. (٢) بڵاوبوونەوە: ***( the ~ of ideas, disease, etc.)*** .
(٣) گەیاندن؛ ناردن.
**propane** (prō′pān), ***n.*** پرۆپین گازێکە بۆ سووتەمەنی بەکاردێت.
**propel** (prə-pel′), ***v.t.*** پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە؛ هاندان؛ بزواندن.
**propellant** (prə-pel′ənt), ***n.*** پاڵ پێوەنەر؛ تەقێنەر (مووشەك، تفەنگ)؛ بزوێنەر.
**propellent** (prə-pel′ənt), ***adj.*** بزوێنەر؛ تەقێنەر.
***n.*** = **propellant.**
**propeller** (prə-pel′ēr), ***n.*** پەروانە (فڕۆکە، پانکە)؛ پاڵنەر.
**propene** (prō′pēn), ***n.*** = **propylene.**
**propensity** (prə-pen′sə-ti), ***n.*** مەیل؛ حەزی زگماکی؛ ئارەزووی سرووشتی: ***( a ~ to exaggerate)*** .
**proper** (prop′ēr), ***adj.*** (١) شیاو؛ گونجاو:
***( the ~ tool for this job)***
(٢) تایبەتی بە: ***( This weather is ~ to California.)*** .
(٣) ڕاست؛ بێ هەڵە؛ تەواو: ***( the ~ pronunciation; in ~ English)*** .
(٤) بەجێ؛ درووست؛ لە جێی خۆیدا؛ ڕاست:
***( It was ~ for him to accept the invitation.)***
(٥) ڕێك‌وپێك (ڕەووشت)؛ سەنگین؛ بەئابڕوو؛ جوان (ڕەفتار).
(٦) بە مانای تەسکی ووشەکە؛ بە مانای ڕاستی:
***( the population of London ~ )***
(٧) [Archaic or Dial.]، (ا) باش؛ ئایاب.
(ب) جوان؛ ئێسك سووك.
(٨) [British Colloq.]، تەواو: ***( a ~ scoundrel)*** .
(٩) [Obs.]، تایبەتی بە خۆ؛ خۆیی.
(١٠) ناوی تایبەتی (ڕێزمان):
***( Sardar, New York, and Karadagh are ~ names.)***
(١١) بە ڕەنگی سرووشتی خۆی کراو.
(١٢) تایبەتی بە ڕۆژێك یا ئاهەنگێکی تایبەتی (نزا، نەریتی ئاینی).
**proper fraction,** کەرتی تەواو؛ کەرتی ڕاست.
**properly** (prop′ēr-li), ***adv.*** بە ڕێك‌وپێکی؛ بە جوانی؛ بە باشی؛ بە شێوەیەکی ڕاست.
**proper noun,** ناوی تایبەتی (ڕێزمان): **( John, Paris, etc.)** .
**propertied** (prop′ēr-tid), ***adj.*** خاوەن زەوی‌وزار؛ خاوەن موڵك.
**property** (prop′ēr-ti), ***n.*** (١) خاوەنێتی؛ خاوەنی؛ خاوەن بوون.
(٢) موڵك؛ موڵك‌و ماڵ؛ زەوی‌وزار؛ خانوو و زەوی‌وزار.
(٣) پارچە زەوی؛ خانوویەکی تایبەتی.
(٤) تایبەخۆ؛ نیشانە: ***( the ~ies of a chemical compound)***
(٥) کەرەسەی بەکارهێنراو لە دەرهێنانی فیلمێك یا شانۆگەرییەکدا.
**prophase** (prō′fāz´), ***n.*** پلەی یەکەمی دابەشبوونی خانەی لەش.
**property tax,** موڵکانە؛ باجی خانوو و زەوی‌وزار.
**prophecy** (prof′ə-si), ***n.*** (١) پێشبینی؛ نوقڵانە.
(٢) پێشبینی ئاینی؛ کارو گوفتاری پێغەمبەر؛ پێغەمبەری.
(٣) پەڕتووکی پێشبینی
**prophesy** (prof′ə-sī´), ***v.t.*** (١) پێشبینی کردن؛ نوقڵانە لێدان.
(٢) [Rare]، نیشانەی ڕوودانی دواڕۆژ بوون.
***v.i.*** (١) پێشبینی؛ پێغەمبەری کردن.
(٢) پەندو ئامۆژگاری ئاینی ووتنەوە یا بڵاوکردنەوە.
**prophet** (prof′it), ***n.*** (١) پێغەمبەر؛ پەیامبەر.
(٢) سەرۆك یا مامۆستای ئاینی بەرز.
(٣) دەم ڕاستی دەستەیەك یا ڕێبازێك. (٤) پێشبین.
**the Prophet,** (١) محەمەد؛ پێغەمبەری ئیسلام.
(٢) پێغەمبەری مۆرمەنەکان.
**prophetess** (prof′it-is), ***n.*** پێغەمبەری ژن
**prophethood** (prof′it-hood´), ***n.*** پێغەمبەری؛ پێغەمبەرێتی.
**prophetic** (prə-fet′ik), ***adj. Also*** **prophetical,** (١) تایبەتی بە پێغەمبەر؛ پێغەمبەری. (٢) تایبەتی بە پێشبینی: ***( a ~ utterance)*** .
**prophylactic** (prō´fə-lak′tik, prof´ə-lak′tik), ***adj.*** (١) لە نەخۆشی پاراستن؛ تایبەتی بە پزیشکەوانی بەرگری.
(٢) تایبەت بە بەرگری یا ڕێگرتن لە نەخۆشی.
***n.*** دەرمانی خۆپاراستن: (ا) لاستیکی گان کردن.
(ب) دەرمان یا ئامێری سکپڕ نەبوون.
**prophylaxis** (prō´fə-lak′sis, prof´ə-lak′sis), ***n.*** (١) خۆ لە نەخۆشی پاراستن. (٢) دەرمان کردنی خۆپاراستن.
**propinquity** (prō-piŋ′kwə-ti), ***n.*** (١) نزیکی. (٢) خزمایەتی.
(٣) لەیەکچوون؛ چوونیەکی تایبەخۆ.
**propitiable** (prə-pish′i-ə-b'l), ***adj.*** ڕازی دەبێ؛ ئاشت دەکرێتەوە.
**propitiate** (prə-pish′i-āt´), ***v.t.*** ڕازی کردن؛ ئاشتکردنەوە؛ دڵ ڕاگرتن:
***( Rain had to be prayed for and priests and gods ~d.)***
**propitiation** (prə-pish´i-ā′shən), ***n.*** (١) دڵ ڕاگرتن؛ ڕازی کردن؛ ئاشتبوونەوە. (٢) قوربانی.
-propitiatory ***(adj.).***
**propitious** (prə-pish′əs), ***adj.*** (١) بەبەزەیی؛ بەڕەحم:

*( The gods were ~ . )*
(٢) بهات؛ بەهات *( a ~ omen)* .
(٣) باش؛ لەبار؛ شیاو *( ~ winds)* .
**propolis** (prop′ə-lis), *n.* ماددەیەکی سریشییە هەنگ لە دارو درەخت کۆی دەکاتەوە بۆ چەسپاندنی شانەکانی.
**proponent** (prə-pō′nənt), *n.* (١) پێشنیازکەر.
(٢) لایەنگر؛ پشتیوان؛ بانگ بۆ هەڵدەر.
**proportion** (prə-pôr′shən, prə-pōr′shən), *n.* (١) ڕێژە؛ بەش. (٢) هاوتایی؛ هاوسەنگی؛ بەرامبەری؛ ڕێکی.
(٣) *( pl.)* ئەندازە؛ پانیی و درێژیی و ئەستووری:
*( a building of large ~s)*
(٤) [Rare]. بەراووردی.
(٥) هاوڕێژەیی (ژمارەوپێوان).
*v.t.* (١) هاوتاکردن؛ گونجاندن؛ هاوڕێژەکردن:
*( to ~ the penalty to the nature of the crime)*
(٢) ڕێک وپێک کردن؛ هاوسەنگ کردن؛ تاووتوێ کردن.
**blow out of proportion,** زل کردن؛ لە ئەندازە کردنە دەرەوە
*( They have blown this incident out of proportion.)*
**in proportion to,** بەگوێرەی
**out of proportion,** بێ ئەندازە؛ لە ئەندازە چووەتە دەرەوە
**proportional** (prə-pôr′shən-'l), *adj.* (١) بەئەندازە؛ بەگوێرەی ئەوەیە؛ هاوتا؛ گونجاو؛ هاوڕێژە:
*( His pay is ~ to his work.)*
(٢) هاوڕێژە (ژمارەوپێوان).
*n.* هەند یا ژمارەی هاوڕێژە (ژمارەوپێوان)
**-proportionally** *(adv.)*; **proportionable** *(adj.)*; **proportionality** *(n.)*.
**proportional representation,** نوێنەری بەگوێرە یا بەئەندازە؛ نوێنەری هەموو حیزب و دەستەکان لە پەرلەماندا بەگوێرەی ئەو دەنگەی گەل پێیان دەدات
**proportionate** (prə-pôr′shən-it), *adj.* بەئەندازە؛ هاوتا؛ هاوڕێژە؛ گونجاو.
*v.t.* هاوتاکردن؛ گونجاندن؛ هاوڕێژەکردن؛ بەئەندازەکردن؛ تاووتوێ کردن.
**-proportionately** *(adv.)*.
**proportionment** (prə-pôr′shən-mənt), *n.* (١) هاوتاکردن؛ تاووتوێ کردن؛ هاوڕێژەکردن؛ بەئەندازەکردن.
(٢) بەئەندازەیی؛ هاوتایی؛ هاوڕێژەیی.
**proposal** (prə-pō′z'l), *n.* (١) پێشنیاز. (٢) خوازبێنی؛ داخوازی
**propose** (prə-pōz′), *v.t.* (١) پێشنیازکردن
(٢) نیازبوون؛ بەتەمابوون.
(٣) پێشنیازی نۆش کردن *( to ~ a toast)*
(٤) نامزەدکردن؛ ناودێرکردن *( I ~ Kawa for chairman.)* .
*v.i.* (١) نیازبوون؛ نەخشەدانان؛ پێشنیازکردن:
*( Man ~s, God disposes.)*
(٢) داخوازی کردن؛ خوازبێنی کردن:
*( He ~d to her and she accepted.)*
**proposition** (prop′ə-zish′ən), *n.* (١) پێشنیاز
(٢) شتی پێشنیازکراو.
(٣) [Colloq.]. مەسەلە؛ کاروبار؛ شت *( a difficult ~ )*
(٤) [Colloq.]. داوای گان لێکردن.
(٥) ووتەیەکە کە ووتەی پێشووی پشتگیری دەکات یا بە درۆی دەخاتەوە (ژیربێژی)
(٦) گریمانە (ژمارەوپێوان).
*v.t.* [Colloq.], داوای گان لێکردن *( He ~ed her.)* .
**-propositional** *(adj.)*.

**propound** (prə-pound′), *v.t.* پێشکەش کردن بۆ لێکۆڵینەوە؛ پێشنیازکردن.
**propractor, propretor** (prō-prē′tēr), *n.* فەرمانڕەوای ناوچەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای کۆن.
**proprietary** (prə-prī′ə-ter′i), *n.* (١) خاوەن موڵك یا دەزگای بازرگانی (وەك: چێشتخانەو فرۆشگا... هتد)؛ خاوەن.
(٢) دەستەی خاوەنان.
(٣) خاوەنێتی موڵك و دەزگای بازرگانی؛ خاوەنی.
(٤) خاوەن و فەرمانڕەوای " proprietary colony " . (ووشەی دوایی ببینە).
(٥) دەرمانێکە کە بەناوی کەسێك یا کۆمپانیایەکەوە تۆمارکراوە و هەر ئەوان مافی فرۆشتنیان هەیە
*adj.* (١) تایبەت بە خاوەن یا خاوەنەکانی دەزگا بازرگانییەکان.
(٢) موڵکی تایبەتی کەسێك یا کۆمپانیایەکە.
(٣) لە خاوەن دەزگای بازرگانی دێت: *( a ~ air)* .
(٤) خاوەنی موڵك یا دەزگای بازرگانییە.
(٥) مافی فرۆشتنی بەدەست کەسێك یا کۆمپانیایەکە: *( a ~ medicine)*
**proprietary colony,** ناوچەیەکی گەورەی ئەمەریکا پێش سەربەخۆیی کە ئینگلتەرە دەیدایە دەست دەرەبەگێك.
**proprietor** (prə-prī′ə-tēr), *n.* (١) خاوەن موڵك یا دەزگای بازرگانی؛ خاوەن. (٢) خاوەن یا دەرەبەگی " proprietary colony " (ووشەی پێشوو ببینە).
**proprietorship** (prə-prī′ə-tēr-ship′), *n.* خاوەنێتی (موڵك و دەزگای بازرگانی).
**proprietress** (prə-prī′ə-tris), *n.* ژنی خاوەن موڵك یا دەزگای بازرگانی.
**propriety** (prə-prī′ə-ti), *n.* (١) بەجێیی؛ درووستی؛ شیان.
(٢) نەزاکەت؛ ڕەفتار جوانی؛ گونجان لەگەڵ ڕەووشت و نەریتی کۆمەڵایەتیدا
*( a breach of ~ )*
**the proprieties,** ڕەووشت و نەریتی کۆمەڵایەتی.
**proprioceptor** (prō′pri-ə-sep′tēr), *n.* شانەی هەستیاری ماسولکەو ماسولکەژێ کە خێرا هەست دەکات بەو هەست بزوێنانەی کە لە ئەندامەکانی لەشەوە دێن.
**prop root,** ڕەگی ڕاگیرکەری ڕووەك.
**proptosis** (prop-tō′sis), *n.* چاو دەرپۆقین.
**propulsion** (prə-pul′shən), *n.* (١) پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە.
(٢) هێزی پاڵ پێوەنەر؛ پاڵ پێوەنەر؛ هێزی پەروانەیی.
**propulsive** (prə-pul′siv), *adj.* پاڵ پێوەنەری؛ پەروانەیی.
**propylaeum** (prop′i-lē′əm), *n.* داڵان یا ڕاڕەوی بەردەمی خانوو.
**propylene** (prō′pə-lēn′), *n.* گازێکی هایدرۆکاربۆنی زووگرگرە. (پێشی دەووترێ: " propene " ) .
**prorate** (prō′rāt′), *v.t. & v.i.* بەشکردن یا هەڵسەنگاندن بە ئەندازە؛ بەشکردن بە ڕێژە: *( to ~ the insurance payment, the rent, etc.)* .
**prorogation** (prō′rō-gā′shən), *n.* دوایی پێ هێنان یا ناشبەتاڵ لێکردنی پەرلەمان.
**prorogue** (prō-rōg′), *v.t.* (١) دوایی پێ هێنان یا ناشبەتاڵ پێکردنی پەرلەمان. (٢) [Rare]، دواخستن.
**prosaic** (prō-zā′ik), *adj.* (١) (ا) پەخشانی؛ تایبەتی بە پەخشان نەك هۆنراوە. (ب) بێ پێچ وپەنایی؛ ڕاست وڕەوانی.
(٢) ئاسایی؛ ووشك؛ ووشك و ناخۆش؛ بازاڕی؛ سادە:
*( a ~ life, person, approach, view of things, style, etc.)*
**-prosaically** *(adv.)*.
**prosaism** (prō′zā-iz′m), *n.* (١) ووشکی و ناخۆشی؛ بازاڕیتی؛ ڕەشۆکێتی؛ سادەییتی. (٢) ووتەیەکی ووشك و بێ تام.
**proscenium** (prō-sē′ni-əm), *n.* (١) شانۆی یۆنان و ڕۆمای کۆن.

(٢) (ا) بەردەمی شانۆ (کە پاش پەردە دادانەوەش هەر دیارە).
(ب) پەردەی شانۆو چوارچێوەکەی.

**proscribe** (prō-skrīb′), *v.t.* (١) بڵاوکردنەوەی ناوی تاوانبارێکی لە وڵات دەرکراو یا بڕیاردراو بە هەڵواسینی (لە ڕۆمای کۆندا).
(٢) قەدەغەکردن: مافی پاراستنی یاسایی لێ سەندنەوە.
(٣) لە وڵات دەرکردن. (٤) ناڕەزایی توند دەربڕین دەربارەی.

**proscription** (prō-skrip′shən), *n.* (١) (ا) قەدەغەکردن:
*( the ~ of the party)*
(ب) قەدەغەکران (٢) لە وڵات دەرکردن.

**prose** (prōz), *n.* (١) پەخشان. (٢) وتە یا گفتوگۆی وشکو ناخۆش.
*adj.* (١) پەخشانی. (٢) سادە؛ وشکو ناخۆش؛ ئاسایی؛ ڕەشۆکی؛ بازاڕی.
*v.t. & v.i.* (١) پەخشان نووسین.
(٢) بەشێوەیەکی سادەو وشکو ناخۆش نووسین یا گفتوگۆکردن.

**prosector** (prō-sek′tēr), *n.* توێ توێکەری لاشە بۆ وانەی توێکاری.

**prosecute** (pros′i-kūt′), *v.t.* (١) تا دوایی لەسەر ڕۆیشتن؛ وازنەهێنان هەتا تەواوکردن: *( to ~ a war with great vigor)* .
(٢) بەردەوام بوون لەسەر؛ بەردەوام خەریك بوون: *( P~ your studies.)* .
(٣) لە دادگا لێپرسینەوە؛ دان بە دادگا: *( to ~ a criminal)* .
(٤) داواکردن لەڕێی یاساوە.
*v.i.* (١) دان بە دادگا؛ لێپرسینەوە لە دادگادا.
(٢) کاری دادخواز یا نوێنەری گشتی بینین لە دادگا.

**prosecuting attorney,** دادخواز یا نوێنەری گشتی (دادگەری)

**prosecution** (pros′i-kū′shən), *n.* (١) لێپرسینەوە لە دادگا؛ دان بە دادگا. (٢) دەستەی دادخواز یا داواکار (بە پارێزەرو دادخواز یا نوێنەری گشتی و شکاتکەرەوە).

**prosecutor** (pros′i-kū′tēr), *n.* دادخواز یا نوێنەری گشتی (دادگەری)

**proselyte** (pros′′l-īt′), *n.* تازە ئاین: تازە وەرگەڕاو بۆ ئاین یا حیزبی تازە؛ ئەندامی تازەی ئاینێك یا حیزبێك.
*v.t. & v.i.* (١) proselylize .
(٢) بە پارە ڕاکێشانی وەرزشکار بۆ تیپی قوتابخانەی خۆ.

**prosencephalic** (pros′en-sə-fal′ik), *adj.* تایبەتی بە بەشی پێشەوەی مێشك

**prosencephalon** (pros′en-sef′ə-lon′), *n.* بەشی پێشەوەی مێشك

**proser** (prō′zēr), *n.* (١) پەخشان نووس.
(٢) بەشێوەی سادەو وشكو ناخۆش شت نووس یا گفتوگۆکەر.

**prosily** (prō′zə-li), *adv.* (١) بەشێوەی پەخشان.
(٢) بە سادەیی؛ بە وشکیو ناخۆشی.

**prosit** (prō′sit), *interj.* نۆش! (بەتایبەتی لەناو ئەڵمانییەکاندا)

**proslavery** (prō-slāv′ēr-i), *adj. & n.* لایەنگری کۆیلەیەتی.

**prosodic** (prə-sod′ik), *adj. Also* **prosodical,** بەپێی زانستی هۆنراوە ڕێکخستن؛ تایبەتی بە هونەری هۆنراوە.
**-prosodically** *(adv.).*

**prosodist** (pros′ə-dist), *n.* شارەزای هونەری هۆنراوە هۆنینەوە.

**prosody** (pros′ə-di), *n.* زانستی ڕێکخستنی هۆنراوە؛ هونەری هۆنینەوەی هۆنراوە.

**prosopopoeia** (prə-sō′pō-pē′ə), *n.* (١) گیان بەبەرداکردنی کەسی مردوو و نەدیارو خەیاڵی (ڕەوانبێژی).
(٢) گیان بەبەرداکردنی شتی بێ گیان.

**prospect** (pros′pekt), *n.* (١) دیمەن (٢) ئەو لایەی خانوویەك یا شتێك ڕووی تێ دەکات (٣) شێوەی هاتنە بەرچاو.
(٤) هیوا؛ بەتەمابوون؛ ئومێدکردن.
(٥) (ا) شتی چاوەڕوانکراو؛ شتی هیوا پێ بوو؛ ئەنجام.
(ب) (.pl) هیوالێکراوی سەرکەوتن یا بردنەوە؛ لەوانەبوونی سەرکەوتن یا قازانج کردن. (٦) کەسێکی پیا ڕابینراو بۆ بوون بە کڕیار.
(٧) (ا) جێگەیەکە هیوای بوونی کانگەی لێ دەکرێ.
(ب) خاكو خۆڵو چەوی تاقیکراوە بۆ کانزا. (ج) کانزا.
*v.t. & v.i.* بۆ گەڕان (بەتایبەتی زێڕو کانزای بەنرخی تر):
*( to ~ for gold)*
**in prospect,** چاوەڕوانکراو؛ پیا ڕابینراو:
*( He's out of work and has nothing in prospect at present.)*

**prospective** (prə-spek′tiv), *adj.* (١) پێشبین؛ هیوابوو بە دواڕۆژ؛ پشت ئەستوور بە دواڕۆژ؛ بەتەمای دواڕۆژ بوو.
(٢) لێ ڕابینراو؛ چاوەڕوان لێکراو: *( a ~ buyer, client, etc.)*

**prospector** (pros′pek-tēr), *n.* کەسێکە کە بۆ زێڕو نەوتو کانزای بەنرخی تر دەگەڕێت.

**prospectus** (prə-spek′təs, pros-pek′təs), *n.* بڵاوکراوەی سەرەتایی: دەربارەی پرۆژەیەك، دەزگایەکی بازرگانی یا زانستی، یا کۆمپانیایەك بۆ پێناسینی بە خەڵك.

**prosper** (pros′pēr), *v.i.* سەرکەوتن (بەتایبەتی لەڕووی ئابوورییەوە)؛ پەرەسەندن؛ گەشەکردن:
*( When business ~s, the country will ~ , too.)*
*v.t.* پەرە پێ سەندن؛ گەشەپێکردن؛ سەرخستن.

**prosperity** (pros-per′ə-ti), *n.* خۆش گوزەرانی؛ گەشەکردن؛ گەشەکردنی دارایی؛ تێروتەسەلی.

**prosperous** (pros′pēr-əs), *adj.* (١) سەرکەوتوو؛ گەشەکردوو؛ پەرەسەندوو؛ ئاوەدان: *( a ~ business, town, etc.)* .
(٢) خۆش گوزەران؛ تێروتەسەل؛ پارەدار؛ سەرکەوتوو.
(٣) بەهات؛ لەبار؛ باش.

**prostate** (pros′tāt), *adj. & n.* پرۆستات (پزیشکەوانی)؛ لووی پرۆستات.
-prostatic *(adj.).*

**prostatectomy** (pros′tə-tek′tə-mi), *n.* لابردنی لووی پرۆستات بە نەشتەرگەری.

**prostate gland,** لووی پرۆستات.

**prostatitis** (pros′tə-tī′tis), *n.* هەوکردنی لووی پرۆستات.

**prosthesis** (pros′thə-sis), *n.* (١) prothesis .
(٢) (ا) نەشتەرگەری پینەکردن: دانانی ئەندامێکی دەستکرد لە جێی ئەندامێکی نەماوی لەشدا (وەك: لاق، قۆڵ، چاو، ددان... هتد).
(ب) ئەندامێکی دەستکردی وەها.
-prosthetic *(adj.).*

**prosthetics** (pros-thet′iks), *n.pl.* نەشتەرگەری پینەکردن. (ووشەی پێشوو ببینە).

**prosthodontics** (pros′thə-don′tiks), *n. Also* **prosthodontia,** ددانسازی پینەکردن: پردو تاقمی ددان کردن لە جێی ددانی کەوتوودا

**prosthodontist** (pros′thə-don′tist), *n.* ددانسازی پینەکەر. (ووشەی پێشوو ببینە).

**prostitute** (pros′tə-tōōt′, pros′tə-tūt′), *v.t.* (١) قەحبەیەتی کردن؛ بوون بە قەحبە. (٢) خۆفرۆشتن؛ بۆ مەبەستی سووكو هیچ‌وپووچ بەکارهێنان: *( to ~ one's abilities)* .
*adj.* سووك؛ نزم؛ قەحبە.
*n.* (١) قەحبە؛ ئافرەتی سووك. (٢) خۆفرۆش.

**prostitution** (pros′tə-tū′shən), *n.* (١) قەحبەیی.
(٢) خۆفرۆشی؛ فرۆشتن بۆ مەبەستی سووك *( the ~ of one's genius)*

**prostrate** (pros′trāt), *adj.* (١) بە لەپا کەوتوو (پەرستن، ملکەچی، غەمباری)؛ قنگەوتلوور کەوتوو. (٢) بە دەمدا یا بە پشتدا ڕاکشاو؛ پاڵ کەوتوو.
(٣) ماندوو؛ پرووکاو؛ هێز لێ براو. (٤) بەزیو؛ ملکەچ؛ بێ چارە.
(٥) تەرز فرێدەر بەسەر زەویدا.
*v.t.* (١) خۆخستن بە لەپا (بۆ پەرستن یا ملکەچی پیشاندان)؛ کڕنووش بردن.

(۲) به زەویدا دان؛ پاڵ کەوتن؛ پاڵ خستن
(۳) هەراسان؛ بەزین؛ هێز لێ برین.

**prostration** (pros-trā'shən), *n.* (۱) (ا) خۆ بە لەپا دان (بۆ پەرستن یا ملکەچی پیشاندان)؛ پاڵ کەوتن؛ قنگەوتلوور کەوتن.
(ب) ریسوایی (بە کڕنووش بردن یا خۆ دان بە زەویدا).
(۲) هێز لێ بران؛ ماندوویتی؛ خەفەتباری؛ بێ چارەیی.

**prostyle** (prō'stīl), *adj.* ریزە کۆڵەکەی لەبەردەمدایە، وەك پەرستگای یۆنانی (خانووسازی)
*n.* خانوویەکە بەردەمەکەی دالانێك بێت بە ریزێك کۆڵەکەوە.

**prosy** (prō'zi), *adj.* (۱) پەخشانی
(۲) سادە؛ ووشك و ناخۆش؛ ڕەشۆکی؛ ئاسایی.
-prosiness *(n.)*.

**protagonist** (prō-tag'ə-nist), *n.* (۱) قارەمانی چیرۆك، داستان، یا شانۆگەری (۲) قارەمان؛ پاڵەوانی ڕێبازێك، مەسەلەیەك، یا ملەملێیەك.

**protamine** (prō'tə-mēn', prō-tə-min), *n.* پرۆتامین؛ پرۆتینی تفتی سادە.

**protasis** (prot'ə-sis), *n.* (۱) بەشی سەرەتای شانۆگەری یۆنانی و ڕۆمانی (۲) ڕستەی مەرجی (وەك بەشی یەکەمی ئەم ڕستەیە).
*( If it rains, I will stay at home.)*

**protean** (prō'ti-ən, prō-tē'ən), *adj.* بێ بار؛ زوو زوو شێوەی خۆگۆڕ؛ ڕەنگی خۆگۆڕ بەپێی کات و شوێن *( a ~ politician)* .

**protease** (prō'ti-ās'), *n.* ئەنزیمی پەلەخوردکردنی پرۆتین.

**protect** (prə-tekt'), *v.t.* (۱) پاراستن؛ پاریزگاری کردن؛ پاس کردن؛ ئاگاداری کردن (۲) پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی بە دانانی باجی گومرگی زۆر لەسەر شتومەکی لە دەرەوە هێنراو

**protection** (prə-tek'shən), *n.* (۱) پاراستن؛ پاریزگاری؛ پاسەوانی.
(۲) پاریزەر؛ پاسەوان (۳) پەساپۆرت.
(٤) [Colloq.]، بەرتیلی خۆپاراستن؛ پارەی بە زۆر لە خەڵك کێشراوە لەلایەن دەستەی شەلاتی و پیاوخراپەوە بۆ ئازار نەدان و هەراسان نەکردن.
(٥) پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی لەڕێی دانانی باجی گومرگی زۆر لەسەر شتومەکی لە دەرەوە هێنراو.

**protectionism** (prə-tek'shən-iz'm), *n.* پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی لەڕێی دانانی باجی گومرگی زۆر لەسەر شتومەکی لە دەرەوە هێنراو.

**protectionist** (prə-tek'shən-ist), *n.* پاریزەری بەرهەمی خۆماڵی (ووشەی پێشوو ببینە).

**protective** (prə-tek'tiv), *adj.* (۱) تایبەتی بە پاراستن؛ بۆ پاراستن کراو (۲) تایبەتی بە باجی سەر شتومەکی لە دەرەوە هێنراو بۆ پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی.

**protective tariff,** تاریفی پاریزەر؛ باجی سەر شتومەکی هێنراو بۆ پاراستنی بەرهەمی خۆماڵی.

**protector, protecter** (prə-tek'tẽr), *n.* (۱) پاریزەر؛ پاسەوان
(۲) پێ سپێردراوی تەختی پاشایی لەکاتی منداڵی یا نەخۆشی پاشادا؛ جێنشینی پاشا

**protectorate** (prə-tek'tẽr-it), *n.* (۱) وولاتی ژێردەستی جێنشینی پاشا (۲) جێنشینێتی پاشا؛ پلەوپایەو ماوەی فەرمانڕەوایی جێنشینی پاشا (۳) [P-]، فەرمانڕەوایی ئینگلتەرە لەژێر دەستی " کرۆمویل " و " ریچارد " ی کوڕی ساڵی ١٦٥٣- ١٦٥٩ . (٤) پەیوەندی وولاتێکی گەورەو بەهێز بە وولاتێکی ژێردەستییەوە؛ پەیوەندی پاریزەرو پاراستە.
(٥) پاراستە؛ وولاتی ژێردەستەو پاریزراو لەلایەن وولاتی پاریزەرەوە.
(٦) دەسەڵاتی وولاتی پاریزەر.

**protectorship** (prə-tek'tẽr-ship'), *n.* پلەوپایەی جێنشینی پاشا؛ جێنشینێتی پاشا.

**protectory** (prə-tek'tẽr-i), *n.* هەتیوخانە؛ لانەی منداڵانی هەژار

**protégé** (prō'tə-zhā'), *n.* [Fr.], *feminine* protégée, کەسێکە کە لەژێر سایەی کەسێکی لە خۆی بەدەسەڵاتتردا بێت؛ پاریزراو؛ شاگرد؛ پیاو.

**proteide, proteid** (prō'ti-īd', prō'ti-id), *n.* پرۆتید؛ پرۆتین.
*adj.* پرۆتیناوی؛ بە پرۆتین.

**protein** (prō'tē-in, prō'tēn), *n.* پرۆتین: ماددەیەکی پێویستە بۆ لەش لە گۆشت و شیرەمەنی و هێلکەدا هەیە.

**proteinase** (prō'tē-in-ās'), *n.* پرۆتیناز: ئەنزیمێکی پرۆتین توێنەرەوەیە.

**proteolysis** (prō'ti-ol'ə-sis), *n.* شیبوونەوەی پرۆتین (وەك لەکاتی پەلەخوردکردنی خواردەمەنیدا).

**protest** (prə-test'), *v.t.* (۱) سووربوون لەسەر؛ بەتوندی و دڵنیاییەوە ووتن: *( He ~ed his innocence.)* .
(۲) ناڕەزایی دەربڕین؛ دژ وەستان؛ بێزاری دەربڕین:
*( to ~ against injustice, the war, etc.)*
(۳) نیازی خۆ دەربڕین بە نەدانەوەی قەرزێك.
*v.i.* (۱) سووربوون لەسەر؛ بەتوندی و دڵنیاییەوە ووتن.
(۲) ناڕەزایی دەربڕین؛ دژ وەستان.
*n.* (۱) ناڕەزایی؛ ناڕەزایی دەربڕین.
(۲) (ا) نامەیەکە لە خاوەن قەرزەوە دەربارەی ڕازی نەبوونی قەرزار بە دانەوەی قەرزەکە. (ب) نامەیەکە دەربارەی ڕازی نەبوونی کەسێك بە باج دان.
(۳) نامەی ناڕەزایی ڕەسمی: *( to lodge a ~ )* .
-protester *(n.)*; protestingly *(adv.)*.
under protest, بە نابەدڵی؛ (کردنی شتێك) پاش ناڕەزایی خۆ دەربڕین:
*( to do something under protest)*

**protestant** (prot'is-tənt), *n.* (۱) [P-] ، پرۆتستانتی؛ ئەندامی کڵێسەی پرۆتستانتی. (۲) ناڕەزایی دەربڕ؛ بێزاری دەربڕ.

**Protestantism** (prot'is-tənt-iz'm), *n.* (۱) ئاینی پرۆتستانتی.
(۲) پرۆتستانتێتی. (۳) پرۆتستانتییەکان؛ کڵێسە پرۆتستانتییەکان

**protestation** (prot'əs-tā'shən), *n.* (۱) دووپاتکردنەوە؛ سووربوون لەسەر؛ بە دڵنیایی ووتن یا بانگ بۆ دان: *( ~s of friendship)*
(۲) ناڕەزایی؛ ناڕەزایی دەربڕین.

**prothalamion** (prō'thə-lā'mi-on), *n.* گۆرانی شایی.

**prothalamium** (prō'thə-lā'mi-əm), *n.* = prothalamion.

**prothesis** (proth'ə-sis), *n.* (۱) برگەیەك یا تیپێك خستنەسەر سەرەتای ووشە (ڕێزمان): (وەك: -be لە ووشەی beloved وە -a لە ووشەی ahead دا) . (پێشی دەووترێ: " prosthesis " ) .
(۲) (ا) ئامادەکردنی شێوی خودایی (خاچ پەرستی).
(ب) مێز یا سفرەی ئەم شێوە. (ج) جێی ئەم مێزە یا سفرەیە.
-prothetic *(adj.)*.

**prothonotary** (prō-thon'ə-ter'i), *n.* (۱) سەرەك دادنووس.
(۲) تۆمارکەری فەرمانی پاپایی (ئاینی کاسۆلیکی).

**prothoracic** (prō'thô-ras'ik), *adj.* تایبەتی بە بەشی پێشەوەی سنگی جانەوەر.

**prothorax** (prō-thôr'aks, prō-thō'raks), *n.* بەشی پێشەوەی سنگی جانەوەر.

**prothrombin** (prō-throm'bin), *n.* پرۆسرۆمبین: ماددەیەکە لە خوێندا یارمەتی مەیینی خوێن دەدات.

**protist** (prō'tist), *n.* ڕووەك یا گیانداری یەك خانەیی.
-protistant *(adj.)*; protistology *(n.)*.

**proto-** (prō'tō, prō'tə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) پێشترین؛ سەرەتا؛ یەکەم: *( protoplast)* .
(ب) گرنگترین؛ یەکەمین؛ سەرەك: *( protogonist)* .
(ج) سەرەتایی؛ کۆنترین؛ یەکەم نموونەی چەشنی خۆ (زمان، گەل)؛ دێرین:
*( proto- Indo- European )*

**protocol** (prō'tə-kol'), *n.* (۱) یەکەم تۆمارنامەی پەیمانێك یا بڕوانامەیەك. (۲) بڕوانامەی پەیمان. (۳) پرۆتۆکۆل: ڕەفتارو نەریت و دەستووری دبلۆماسی و فەرمانڕەوایی (بەتایبەتی هی نێوان وولاتان).

*v.i.* پەیمان دارشتن یا گەڵاڵەکردن.

**protogine** (prō′tə-jin, prō′tə-jēn′), *n.* پرۆتۆجین جۆرێکە لە بەردی گرانیت لە شاخی " ئالپ " ی سویسرادا هەیە.

**protolithic** (prō′tə-lith′ik), *adj.* تایبەتی بە سەرەتای چاخی بەردین.

**protomartyr** (prō′tō-mär′tĕr), *n.* یەکەم گیانبەختی (بەتایبەتی لەرێی خاچ پەرستیدا).

**protomorph** (prō′tə-môrf′), *n.* شێوەی سەرەتایی (زیندەوەرزانی).

-protomorphic *(adj.)*.

**proton** (prō′ton), *n.* پرۆتۆن: پارچەیەکی ناوکی ئەتۆمییە کارەبای کەرتی لەسەرە

**protonema** (prō′tə-nē′mə), *n.* تەرزێکی دەزوولەیی قەوزەیە دەبێتە قەوزەی هەراش

**protonotary** (prō-ton′ə-ter′i, prō′tə-nō′tĕr-i), *n.* = prothonotary.

**protopathic** (prō′tə-path′ik), *adj.* تایبەت بە هەستی سەرەتایی و تەنها هەست بە شتی توندوتیژ دەکات وەک ئازار.

**protoplasm** (prō′tə-plaz′m), *n.* پرۆتۆپلازم: مادەی زیندووی بنچینەیی شانەی گیاندارو رووەک؛ بەشی زیندووی خانە.

-protoplasmic *(adj.)*.

**protoplast** (prō′tə-plast′), *n.* (١) prototype. (٢) پرۆتۆپلازمی ناوەوەی خانە؛ بەشی زیندووی خانە.

-protoplastic *(adj.)*.

**protostele** (prō′tə-stē′li, prō′tə-stēl′), *n.* لوولەی پێدا پۆپشتنی ناوکی بەرزەبۆو نزمەبۆی رووەك.

**prototypal** (prō′tə-tīp′'l), *adj.* تایبەت بە یەکەم نموونە؛ هی کۆنترین نموونە؛ دێرین

**prototype** (prō′tə-tīp′), *n.* نموونەی یەکەمی توخمی خۆ؛ کۆنترین نموونەی شتێك؛ یەکەم مۆدێل؛ یەکەم نموونە: *( Benjamin Franklin is the real practical ~ of the American. ; the ~ of an airplane)*

**prototypic** (prō′tə-tip′ik), *adj.* = prototypal.

**protozoan** (prō′tə-zō′ən), *n.* زیندەوەری یەك شانەیی بە چاو نەبینراو.

*adj.* تایبەت بەم زیندەوەرە یەك شانەییانە.

**protozoology** (prō′tə-zō-ol′ə-ji), *n.* زانستی گیاندارە یەك خانەییەکان (گیاندارناسی).

**protozoon** (prō′tə-zō′on), *n.* = protozoan.

**protract** (prō-trakt′), *v.t.* (١) درێژەپێدان: دووردرێژکردنەوە: *( a ~ed war, argument, etc.)*
(٢) نەخشەکێشان بە گۆشەپێو.
(٣) درێژکردنەوە؛ دەرپەڕاندن؛ دەرپەڕاندن.

**protractile** (prō-trak′t'l, prō-trak′til), *adj.* *Also* protractible, درێژ دەکرێتەوە.

**protraction** (prō-trak′shən), *n.* (١) درێژەپێدان
(٢) نەخشەکێشان بە گۆشەپێو.

**protractive** (prō-trak′tiv), *adj.* درێژەپێدەر

**protractor** (prō-trak′tĕr), *n.* (١) درێژەپێدەر. (٢) گۆشەپێو.
(٣) ماسولکەی پەل درێژکەرەوە.

**protrude** (prō-trōōd′), *v.t. & v.i.* دەرپۆقین؛ دەرپەڕین؛ سەردەرهێنان؛ دیاربوون.

**protrudent** (prō-trōō′d'nt), *adj.* دەرپۆقیو؛ دەرپەڕیو

**protrusible** (prō-trōō′sə-b'l), *adj.* = protrusile.

**protrusile** (prō-trōō′s'l, prō-trōō′sil), *adj.* دەردەپەڕێنرێ (وەك زمان یا لمۆزی فیل)؛ درێژ دەکرێتەوە.

**protrusion** (prō-trōō′zhən), *n.* (١) دەرپۆقین؛ دەرپەڕین؛ سەردەرهێنان. (٢) شتی دەرپۆقیو؛ ئەندامی دەرپۆقیو؛ شتی سەردەرهێنەر؛ بەرزەك؛ چوکڵە؛ گرێ.

**protrusive** (prō-trōō′siv), *adj.* (١) دەرپۆقیو؛ دەرپەڕیو؛ زۆر بەدەرەوە. (٢) خۆتێهەڵقورتێنەر؛ خۆ بەسەردا سەپێن؛ خۆنوێن.

**protuberance** (prō-tū′bĕr-əns), *n.* *Also* protuberancy.
(١) هەڵتۆقین؛ دەرپۆقین؛ ئاوسان؛ کیف کردن.
(٢) ئاوساوی؛ تلۆق؛ شتی دەرپۆقیو؛ بەرزەك؛ گرێ؛ چوکڵە.

**protuberant** (prō-tōō′bĕr-ənt, prō-tū′bĕr-ənt), *adj.* کیف کردوو؛ ئاوساو؛ دەرپۆقیو؛ دەرپەڕیو؛ هەڵتۆقیو.

**protuberate** (prō-tōō′bə-rāt′, prō-tū′bə-rāt′), *v.i.* ئاوسان؛ تلۆق کردن؛ دەرپۆقین؛ دەرپەڕین.

**proud** (proud), *adj.* (١) شانازی؛ سەربەرز.
(٢) بەفیز؛ لووت بەرز؛ لەخۆبایی. (٣) بەختیار؛ دڵخۆش؛ شاد.
(٤) خۆش؛ دڵخۆشکەر.
(٥) بەشکۆ؛ زۆر رێکوپێك؛ چاك؛ نایاب: *( a ~ fleet)*.
(٦) خۆش رەوت؛ بەدەماغ؛ چالاك؛ گورج وگۆڵ: *( a ~ stallion)*.
(٧) [Obs.]، ئازا.

-proudly *(adv.)*; proudness *(n.)*.

proud of, شانازی پێوەکردن.

**provable** (prōōv′ə-b'l), *adj.* دەسەلمێنرێ؛ ساغ دەکرێتەوە؛ بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە

**prove** (prōōv), *v.t.* (١) تاقیکردنەوە.
(٢) سەلماندن؛ ساغ کردنەوە؛ بەڵگە بۆ هێنانەوە.
(٣) [Archaic]، چەشتن؛ بۆ دەرکەوتن بە تاقیکردنەوە.
(٤) سەلماندن یا تاقیکردنەوەی راستی ژماردنێك (ژمارەوپێوان).
(٥) پیاچوونەوە یا بژاردنی پەراوەی چاپەمەنی.

*v.i.* بۆ دەرکەوتن پاش تاقیکردنەوە: *( The operation ~d fatal.)*.

**provenance** (prov′ə-nəns), *n.* سەرچاوە؛ جێی لێوە هاتوو.

**Provencal** (prō′vən-säl′, prov′ən-säl′), *adj.* پرۆڤانسی؛ تایبەت بە ناوچەی " پرۆڤانس " ی فەرەنسی کە دەکەوێتە خوارووی رۆژهەڵاتی وولاتەکەوە.

*n.* (١) شێوەزمانی پرۆڤانسی؛ پرۆڤانسی. (٢) هاوولاتییەکی پرۆڤانس.

**provender** (prov′ən-dĕr), *n.* (١) ئالف؛ کا؛ کاوجۆ.
(٢) [Colloq.]، خواردەمەنی (لەرووی گاڵتەوە).

**provenience** (prō-vē′ni-əns), *n.* = provenance.

**proverb** (prov′ĕrb), *n.* پەندی پێشینان؛ قسەی نەستەق.

*v.t.* دەربڕین بە پەند.

**proverbial** (prə-vūr′bi-əl), *adj.* (١) وەك پەندی پێشینان.
(٢) لە پەندی پێشیناندا دەبڕاوە
(٣) وەك پەندی پێشینانی لێ هاتووە؛ ناسراو.

-proverbially *(adv.)*.

**provide** (prə-vīd′), *v.t.* (١) ئامادەکردن؛ پێشەکی ئامادەکردن بۆ ناکاوی دواڕۆژ؛ دووربینی کردن. (٢) پێدان؛ خستنە بەردەست: *( to ~ someone with money, iformation, etc.)*
(٣) مەرج دانان.

*v.i.* (١) پێشەکی خۆ ئامادەکردن بۆ ناکاوی دواڕۆژ: *( to ~ against a shortage of wheat)*
(٢) مەرج دانان.
(٣) ( ~ for )، بەخێوکردن؛ پێویستی ژیان بۆ دابینکردن: *( to ~ for one's children)*

**provided** (prə-vīd′id), *conj.* بە مەرجێك؛ تەنها ئەگەر؛ ئەگەر. *( I will forgive you ~ that you apologize.)*

**providence** (prov′ə-dəns), *n.* (١) دووربینی؛ پێشەکی خۆ

ئامادەکردن بۆ ناکاوی دواڕۆژ (٢) دەست بە پارەوە گرتن؛ پاشەکەوت کردن.
(٣) بەزەیی خواو سرووشت؛ بەزەیی خوا؛ چاودێری کردنی خوا بۆ ئادەمیزادو هەموو بوونەوەرێکی تری جیهان. (٤) [P-]، خودا؛ یەزدان.

**provident** (prov′ə-dənt), *adj.* (١) دووربین؛ بە تەنگ دواڕۆژەوە هاتوو. (٢) دەست بە پارەوە گر؛ پاشەکەوتکەر.

**providential** (prov′ə-den′shəl), *adj.* (١) تایبەتی بە بەزەیی خودایی. (٢) خواکردە؛ خوا وای داناوە.
(٣) بهات. گونجاو؛ خۆش (ڕووداو)؛ بەختەوەر.

**providing** (prə-vīd′iŋ), *conj.* = provided.

**province** (prov′ins), *n.* (١) ناوچەی ژێردەستی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما لەدەرەوەی ئیتاڵیادا. (٢) ناوچە؛ هەرێم.
(٣) هەموو ناوچەکانی دەرەوەی پایتەخت.
(٤) مەودای شارەزایی و دەسەڵات و ئەرک.
(٥) لقی زانیاری؛ یەکێك لە بەشەکانی زانست یا هونەر.
(٦) سەرەك قەشەنشین.

**provincial** (prə-vin′shəl), *adj.* (١) تایبەتی بە ناوچەکانی دەرەوەی پایتەخت. ناوچەیی. (٢) لادێیی؛ تایبەتی بە لادێ یا دەرەوەی شار.
(٣) بیروڕا تەسك؛ تەسکبین؛ مێشك تەسك؛ ناوچەپەرست:
*( a ~ outlook, point of view, attitude, etc.)*

*n.* (١) لادێیی: کەسێکی لادێیی.
(٢) کەسێکی تەسکبین؛ مێشك تەسك؛ ناوچەپەرست.

**provincialism** (prə-vin′shəl-iz′m), *n.* (١) لادێیەتی.
(٢) مێشك تەسکی؛ ناوچەگەرێتی؛ بیروڕا تەسکی؛ تەسکبینی.
(٣) خوویەك یا نەریتێکی ناوچەگەری.
(٤) ووشەیەك یا شێوەی قسەکردنی تایبەتی بە ناوچەیەك.

**provinciality** (prə-vin′shi-al′ə-ti), *n.* = provincialism.

**proving ground,** شوێنی تاقیکردنەوەی بیروڕاو کەرەسەی تازە؛ تاقیگە.

**provision** (prə-vizh′ən), *n.* (١) ئامادەکردن؛ پێدان.
(٢) (*pl*). ئازووقە؛ تفاق؛ قایمەکاری.
(٣) قایمە. خۆ کۆکردنەوەو ئامادەکردن بۆ شتێك یا ناکاوێك.
(٤) خۆ ئامادەکردن بۆ دواڕۆژ؛ پاشەکەوت کردن
*( to make ~ for the future)*
(٥) مەرج. بەند *( one of the ~s in the will)* .
(٦) پێشەکی دامەزراندنی کاربەدەستی بەرزی کڵێسە لەلایەن پاپاوە.

*v.t.* ئازووقە بۆ دانان؛ تفاق خستن

**provisional** (prə-vizh′ən-′l), *adj.* (١) سەردەمی؛ کاتی:
*( a ~ government)*
(٢) مەرجی؛ بە مەرجەوە.

-provisionally *(adv.)*.

**provisionary** (prə-vizh′ən-er′i), *adj.* = provisional.

**provisioner** (prə-vizh′ən-ēr), *n.* ئازووقە بۆ پەیداکەر؛ تفاق بۆ هێنەر؛ ئازووقە پێدەر.

**proviso** (prə-vī′zō), *n.* (١) مەرجی ڕێکەوتنێك؛ بەندی مەرجی ڕێکەوتنێك. (٢) مەرج.

**provisory** (prə-vī′zēr-i), *adj.* (١) مەرجی. (٢) سەردەمی؛ کاتی.

**provitamin** (prō-vī′tə-min), *n.* پرۆڤیتامین: ماددەیەکە لە لەشدا دەگۆڕدرێت بۆ ڤیتامین.

**provocation** (prov′ə-kā′shən), *n.* (١) (ا) شەڕ پێ فرۆشتن؛ تووڕەکردن؛ دەمارگرتن؛ تەنگاوکردن. (ب) وورووژاندن؛ هاندان.
(٢) هۆی تووڕەیی یا وورووژاندن؛ هاندەر؛ شتی تووڕەکەر.

**provocative** (prə-vok′ə-tiv), *adj.* (١) شەڕ پێ فرۆش؛ تووڕەکەر *( a ~ act, gesture, etc.)*
(٢) وورووژێن؛ هەوەس هەڵسێن: *( She was wearing a ~ dress.)* .

**provoke** (prə-vōk′), *v.t.* (١) وورووژاندن؛ کلك پێوەکردن؛ هەست جوڵاندن. (٢) (ا) شەڕ پێ فرۆشتن؛ شەڕنانەوە.
(ب) تووڕەکردن؛ ڕق هەڵساندن؛ دەمارگرتن.
(٣) بوون بە هۆ: *( to ~ laughter)* .

**provoking** (prə-vōk′iŋ), *adj.* تووڕەکەر؛ پەستکەر؛ دەمارگری؛ ڕق هەڵسێنەر.

-provokingly *(adv.)*.

**provost** (prov′əst), *n.* (١) سەرۆکی شارەوانی لە ئوسکوتلەندە
(٢) [.Obs]، کارگێری بەندیخانە. (٣) سەرۆکی کڵێسە.
(٤) (ا) سەرۆکی هەندێ دانشگا لە ئینگلتەرەو ئوسکوتلەندە.
(ب) کاربەدەستێکی گەورەی زانکۆی ئەمەریکی؛ سەرۆکی هەندێ زانستگای ئەمەریکی.

**provost court,** دادگای سوپایی تاوانی بچووکی ناوچەی داگیرکراو.

**provost guard,** دەستەی پۆلیسی سوپا؛ دەستەی پاسەوانی سوپا.

**provost marshal,** سەرەك دەستەی پۆلیسی سوپا.

**prow** (prou), *n.* (١) پێش یا لووتە تیژەکەی بەلەم و کەشتی؛ پەراسووبەندی پێشی بەلەم و کەشتی. (٢) پێشی شتێك یا لووتەکەی.

**prow** (prou), *adj.* [Archaic], ئازا؛ پاڵەوان.

**prowess** (prou′is), *n.* (١) ئازایی؛ پاڵەوانی؛ جوامێری.
(٢) کارێکی ئازایانە یا پاڵەوانانە.
(٣) شارەزایی؛ لێهاتوویی؛ کارامەیی.

**prowl** (proul), *v.i. & v.t.* دەوروخولدانی شوێنێك (بۆ دزی یا سووسەکردن)؛ گەڕان بە شوێنی قەدەغەدا.

*n.* دەوروخولدان (بۆ دزی یا سووسەکردن).

on the prowl, لە دەوروخولدانی شوێنێکدایە.

**prowler** (proul′ēr), *n.* دەوروخولدەری شوێنێك (بۆ دزی یا سووسەکردن)؛ پەرژین شکێن.

**prowl car,** = squad car.

**proximal** (prok′sə-m′l), *adj.* (١) نزیکترین.
(٢) نزیکی ناوەڕاستی لەش یا بەیەکگەیشتنی پەل و لەش.

**proximate** (prok′sə-mit), *adj.* (١) نزیکترین. (٢) نزیکەی.

**proximity** (prok-sim′ə-ti), *n.* نزیکی (شوێن یا کات).

**proximo** (prok′sə-mō′), *adv. Also* prox, [Archaic], لە مانگی داهاتوودا: *( on the 9 th ~ )* .

**proxy** (prok′si), *n.* (١) بریکاری؛ مافی بریکاری؛ جێگری؛ نوێنەری:
*( to vote by ~ )*
(٢) برینامە؛ بڕوانامەی بریکاری یا نوێنەری.
(٣) بریکار؛ نوێنەر؛ جێگر.

**prude** (prōōd), *n.* خۆ بە سەنگین و بە ئابڕوو و ڕەووشت چاك دەرخەر (بەتایبەتی ئافرەت)؛ کەسێکە کە بە سەرزاری لە ڕادە بەدەر گوێ دەداتە ڕەووشت جوانی و هەڵسان و دانیشتنی بەجێ.

**prudence** (prōō′d′ns), *n.* (١) دووربینی؛ وریایی و لەسەرخۆیی؛ ژیری. (٢) دەست بە پارەوە گرتن؛ گیری؛ پارە بەفیڕۆنەدان.

**prudent** (prōō′d′nt), *adj.* (١) دووربین؛ ژیر؛ وریاو لەسەرخۆ؛ تێگەیشتوو. (٢) دەست بە پارەوە گر؛ خەمی خۆ خۆر.

**prudential** (prōō-den′shəl), *adj.* (١) تایبەت بە دووربینی؛ ژیرانەو وریایانە. (٢) دووربین؛ وریاو لەسەرخۆ؛ تێگەیشتوو.

**prudently** (prōō′d′nt-li), *adv.* بە دووربینانە؛ بە ژیری؛ بە تێگەیشتووانە؛ بە وریایانەو لەسەرخۆیی.

**prudery** (prōōd′ēr-i), *n.* (١) خۆدەرخستن بە سەنگین و بە ئابڕوو و ڕەووشت جوان؛ توندوتیژی ڕووکەشی دەربارەی ڕەووشت؛ لە ئەندازە بەدەر گوێدان بە ڕەووشت جوانی ڕووکەشی. (٢) وێنەیەك لەم جۆرە ڕەفتارە.

**prudish** (prōōd′ish), *adj.* خۆ بە ڕەووشت جوان و بە ئابڕوو و شەرمن دەرخەر؛ شەرمن بە سەرزاری.

-prudishly *(adv.)*; prudishness *(n.)*.

**pruinose** (prōō′i-nōs′), *adj.* داپۆشراو بە تۆزی سپی (وەك تری).

هەڵووژەو هەندێ گەڵا).

**prune** (prōōn), ***n.*** (١) هەڵووژە ڕەشەی ووشك.
(٢) هەڵووژە (بەتایبەتی کە بتوانرێ ووشك بکرێتەوە).
(٣) [Slang]. کەسێکی بەد سرووشتی خەڵك لێ بێزار بوو؛
کەسێکی بە سکاڵاو تەنگەجێکڵانەو تووڕەوتڕۆو ناپەسەند.

**prune** (prōōn), ***v.t.*** (١) قەڵەم کردن؛ لق‌وپۆپ کردن؛ باخ بڕین؛
هەڵپاچین ***( to ~ a tree, orchard, etc.)*** .
(٢) شتی زیادەو ناپێویست لێ فڕێدان یا دەرهێنان؛ کورتکردنەوە:
***( to ~ a speech)***
(٢) کەمکردنەوە؛ هێنانەوەیەك: ***( to ~ a budget)*** .

**prunella** (prōō-nel′ə), ***n.*** جۆرە قوماشێکی خوری میل میلە.

**prurience** (proor′i-əns), ***n.*** *Also* **pruriency,** هەوەسی جووت
بوون؛ تاسەی گان کردن.

**prurient** (proor′i-ənt), ***adj.*** (١) حەشەری: هەمیشە هەوەسی لەسەر
جووت بوون (٢) تایبەت بە هەوەسی جووت بوون: ***( ~ thoughts)*** .
(٢) هەوەس هەڵسێن؛ هەستی جووت بوون بزوێن: ***( ~ literature)*** .

**pruriginous** (proo-rij′ə-nəs), ***adj.*** گەڕ: تایبەت بە گەڕی؛
ئالۆشی.

**prurigo** (proo-rī′gō), ***n.*** گەڕی: خوروو: نەخۆشی‌یەکی پێستە وەك
گەڕی؛ ئالۆش

**pruritic** (proo-rit′ik), ***adj.*** بەخورو؛ بەئالۆش؛ ئالۆشاوی.

**pruritus** (proo-rī′təs), ***n.*** خورووی زۆر؛ ئالۆش

**Prussian** (prush′ən), ***adj.*** (١) پرووسی (گەل، زمان، کلتوور).
(٢) تایبەتی بە چینی سوپای پرووسیا لە باکووری ئەڵمانیا: توندوتیژو
بەزەبرو بەفیز

***n.*** (١) پرووسی: دانیشتووی پرووسیا.
(٢) زمانی پرووسی؛ شێوەزمانی ئەڵمانی ناوچەی پرووسیا.

**Prussian blue,** شینی تۆخ.

**prussic acid,** ترشی پرۆسیك: ترشێکی گازی ژەهراوی‌یە بۆنی بادەمی
تاڵی لێ دێت.

**pry** (prī), ***n.*** (١) نوێل. (٢) (ا) ڕکێف؛ دەسەڵات. (ب) دەست تێخستن.

***v.t.*** (١) هەڵپچڕاندن؛ بە نوێل بەرزکردنەوە یا جوڵاندن؛ هەڵتەکاندن؛
بە ئامێرێکی نووك تیژ کردنەوە: ***( to ~ open)*** .
(٢) بە زۆر لێ دەرهێنان (وەڵام، دەنگوباس):
***( to ~ a confession out of a suspect)***

**pry** (prī), ***v.i.*** **( ~ into ),** بەدزی‌یەوەو بەووردی تێڕوانین‌و پرسیاری
نابەجێ‌و سووسەکردن: ***( to ~ into other people's affairs)*** .

**pryer** (prī′ẽr), ***n.*** = **prier.**

**prying** (prī′iŋ), ***adj.*** زۆر بە پرسیار (بەتایبەتی هی نابەجێ)؛
حەزکەر لە دەنگوباس وەرگرتن‌و بەشێوەیەکی سووسەیی‌و نابەجێ.

**PS., P.S., p.s., = postscript.**

**psalm** (säm), ***n.*** (١) گۆرانی یا سروودی ئاینی پیرۆز.
(٢) یەکێك لە گۆرانی یا سروودەکانی ئینجیل.

***v.t.*** سروودی ئاینی خوێندن بە دەنگەوە؛ گۆرانی ئاینی ووتن.

**psalmbook** (säm′book′), ***n.*** پەڕتووکی گۆرانی‌و سروودی ئاینی
پیرۆز

**psalmist** (säm′ist), ***n.*** دانەری گۆرانی‌و سروودی ئاینی.
**the Psalmist,** پێغەمبەر " داود " ی جوولەکە (کە دەڵێن دانەری
زۆربەی گۆرانی‌و سروودەکانی ئینجیلە).

**psalmody** (säm′ə-di, sal′mə-di), ***n.*** (١) خوێندنەوەی سروودی
ئاینی بە دەنگەوە؛ گۆرانی ئاینی ووتن. (٢) کۆمەڵێك گۆرانی‌و سروودی
ئاینی (٣) دانان یا ڕێکخستنی گۆرانی‌و سروودی ئاینی.

**-psalmodic** ***(adj.)***; **psalmodist** ***(n.).***

**Psalter** (sôl′tẽr), ***n.*** (١) بەشی سروودی ئاینی ئینجیل.
(٢) [p-]. **psalmbook** .

**psalmterium** (sôl-têr′i-əm), ***n.*** = **omasum.**

**psaltery** (sôl′tẽr-i, sôl′tri), ***n.*** (١) سەنتوور.
(٢) [P-]. **Psalter** .

**pseudo** (sōō′dō, sū′dō), ***adj.*** درۆزنە؛ ساختە؛ درۆ؛ نیمچە:
***( a ~ intellectual)***

**pseudo- , pseud-** (sōō′də, sū′dō), پێشگرێکە بەمانای: درۆ؛
درۆزنە؛ ساختە؛ نیمچە: ***( pseudonym; pseudoscience)*** .

**pseudomorph** (sōō′də-môrf′, sū′də-môrf′), ***n.*** (١) شێوەی
ساختە یا نائاسایی. (٢) کانزایەکە شێوەی لە کانزایەکی تر دەچێ.

**-pseudomorphic** ***(adj.)***; **pseudomorphism** ***(n.)***;
**pseudomorphous** ***(adj.).***

**pseudonym** (sōō′də-nim′, sū′də-nim′), ***n.*** ناوی خوازراو یا
دروستکراو؛ ناوی نهێنی یا درۆ.

**pseudonymous** (sū-don′ə-məs), ***adj.*** (١) ناوی نهێنیدار؛
ناوی درۆ لێنراو (٢) بە ناوی نهێنی یا درۆوە نووسراو؛
لەژێر ناوی ساختەدا نووسراو.

**pseudopod** (sū′də-pod′), ***n.*** = **pseudopodium.**

**pseudopodium** (sū′də-pō′di-əm), ***n.*** پێی درۆزنە: کشانی
سەردەمی پرۆتۆپلازمی هەندێ زیندەوەری یەك خانەیە بۆ پێ جوڵانەوەو
خواردەمەنی وەرگرتن

**pshaw** (shô), ***interj. & n.*** ئۆف: دەنگێکە پەستی، بێزاری، لاقرتێ،
نارەزایی، بڕوا نەکردن؛ یا تاقەت نەمان دەردەبڕێت.

***v.i. & v.t.*** دەنگێکی وەها لێوە هاتن.

**psilosis** (sī-lō′sis), ***n.*** (١) قژ ڕووتانەوە. (٢) **sprue** .

**psittacosis** (sit′ə-kō′sis), ***n.*** نەخۆشی تووتی: نەخۆشی‌یەکی درمی
تووتی‌و باڵندەی هاوتوخمێتی بە مرۆڤ دەگات‌و دەبێتە هۆی تا و پەنوو.
(پێشی دەووترێ: " **parrot fever** ") .

**psoriasis** (sō-rī′ə-sis, sə-rī′ə-sis), ***n.*** نەخۆشی‌یەکی پێستە
نیشانەکانی دروست بوونی پەڵەی سوورە لەسەر پێست‌و توێژ فڕێدانە.

**psyche** (sī′ki), ***n.*** (١) گیان؛ دەروون؛ ڕەوان. (٢) مێشك؛ هۆش.

**psychedelic** (sī′kə-del′ik), ***adj.*** تایبەتی بە زرەخەو بینین‌و
وورێنەکردن؛ تایبەتی بە هەلوەسەکردن یا شتی سەیر هاتنە بەرچاو.

**psychiatric** (sī′ki-at′rik), ***adj.*** (١) تایبەت بە پزیشکەوانی دەروون
یا مێشك: ***( a ~ clinic)*** .
(٢) دەرمانی پزیشکەوانی مێشك بەکارهێن: ***( ~ treatment)***

**psychiatrist** (sī-kī′ə-trist), ***n.*** پزیشکی دەروون؛
پزیشکی نەخۆشی مێشك.

**psychiatry** (sī-kī′ə-tri), ***n.*** پزیشکەوانی دەروون؛ دەروونناسی؛
پزیشکەوانی مێشك.

**psychic** (sī′kik), ***adj.*** (١) دەروونی؛ مێشکی؛ هۆشی؛ گیانی.
(٢) لە سرووشت بەدەر. (٣) هەستیار بۆ هێزی گیانی‌و لە سرووشت بەدەر

***n.*** (١) کەسێکی هەستیار بۆ هێزی گیانی‌و لە سرووشت بەدەر.
(٢) کەسێکی هەستیارە گوایە پردێکە لەنێوان ئەم جیهانەو جیهانی مردووان‌و
لە سرووشت بەدەردا.

**-psychical** ***(adj.)***; **psychically** ***(adv.).***

**psycho** (sī′kō), ***adj. & n.*** [Colloq.], = **psychopath.**

**psycho-** (sī′kō, sī′kə), پێشگرێکە بەمانای: دەروون؛ مێشك:
***( psychology)***

**psychoanalysis** (sī′kō-ə-nal′ə-sis), ***n.*** شیکردنەوەی دەروونی

**psychoanalyst** (sī′kō-an′əl-ist), ***n.*** پزیشکی دەروون؛
شیکەرەوەی دەروون.

**psychoanalytic** (sī′kō-an′ə-lit′ik), ***adj.*** *Also* psychoana-
lytical, تایبەتی بە شیکردنەوەی دەروون؛ لەڕووی شیکردنەوەی دەروونەوە

**-psychoanalytically** ***(adv.).***

**psychoanalyze** (sī′kō-an′ə-līz′), ***v.t.*** شیکردنەوەی دەروون:

*( to ~ someone)*

**psychobiology** (sī´kō-bī-ol'ə-ji), ***n.*** (١) زانستی لێکۆڵینەوەی پەیوەندی ڕیندەوەرزانی و دەروونناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوەی پەیوەندی لەش و مێشک و جوێنێتی کارکردنە سەر یەکتری. (٢) لێکۆڵینەوەی نەخۆشی دەروونی لەڕێی لێکۆڵینەوەی لەشەوە.

**psychodrama** (sī´kə-drä´mə), ***n.*** پێ هەڵسانی نەخۆشی دەروون بە دەربڕین یا نواندنی هۆی نەخۆشییەکەی هەر وەک لەسەر شانۆ بێت.

**psychogenesis** (sī´kə-jen'ə-sis), ***n.*** (١) پەیدابوون و پەرەسەندنی تایبەخۆی دەروونی. (٢) سەرچاوەی دەروونی کردەوەیەک یا تایبەخۆیەک.

**psychogenetic** (sī´kə-jə-net'ik), ***adj.*** = psychogenic.

**psychogenic** (sī´kə-jen'ik), ***adj.*** سەرچاوەکەی دەروونییە؛ لە مێشک یا دەروونەوە هەڵقوڵاوە.

**psychognosis** (sī-kog'nə-sis, sī´kog-nō'sis), ***n.*** دیاری کردنی نەخۆشی دەروونی یا مێشک.

**psychograph** (sī'kə-graf´, sī'kə-gräf´), ***n.*** وێنەی ڕوونکردنەوەی دەروونی.

**psychological** (sī´kə-loj'i-k'l), ***adj. Also*** psychologic, دەروونی؛ تایبەتی بە مێشک: *( a ~ problem)*

-psychologically *(adv.)*.

**psychologist** (sī-kol'ə-jist), ***n.*** دەروونزان؛ زانای دەروون.

**psychology** (sī-kol'ə-ji), ***n.*** دەروونزانی؛ زانستی دەروون.

**psychometrics** (sī´kə-met'riks), ***n.*** (١) پێوانی زیرەکی و نەخۆشی مێشک. (٢) نەخشەی تاقیکردنەوە و پێوانی دەروون.

**psychometry** (sī-kom'ə-tri), ***n.*** (١) فێربوون دەربارەی شتێک یا خاوەنەکەی بە دەست لێدانی ئەو شتە یا لێ نزیکبوونەوە. (٢) psychometrics

**psychoneurosis** (sī´kō-nyoo-rō'sis), ***n.*** = neurosis.

**psychoneurotic** (sī´kō-nyoo-rot'ik), ***adj.*** = neurotic.

**psychopath** (sī'kə-path´), ***n.*** شێت؛ کەسێکی مێشک تێکچوو (بەتایبەتی دژ بە کۆمەڵ وەستاو).

-psychopathic *(adj.)*.

**psychopathy** (sī-kop'ə-si), ***n.*** نەخۆشی مێشک؛ مێشک تێکچوون بەتایبەتی کە دژ بە کۆمەڵ وەستانی لەگەڵ بێت.

**psychophysics** (sī´kō-fiz'iks), ***n.pl.*** دەروونزانی لەش؛ لقێکە لە دەروونزانی کە لە پەیوەندی نێوان لەش و مێشک دەکۆڵێتەوە.

-psychophysical *(adj.)*; psychophysicist *(n.)*.

**psychosis** (sī-kō'sis), ***n.*** نەخۆشی مێشک؛ شێتی؛ نەخۆشییەکی مێشکە بریتییە لە نەگونجانی نەخۆشەکە لەگەڵ دەوروبەریدا و پەیوەندی نەمانی لەگەڵ ڕاستی دەوروپشتیدا.

**psychosomatic** (sī´kō-sō-mat'ik), ***adj.*** تایبەتی بە دەروون و لەش؛ تایبەتی بە پەیوەندی نێوان باری مێشک و لەش؛ تایبەتی بە نەخۆشییەک کە لە مێشک تێکچوونەوە تووش دەبێت: *( a ~ illness)*

***n.*** کەسێکە کە نەخۆشییەکەی لە مێشک تێکچوونەوەیە.

**psychotherapeutics** (sī´kō-ther´ə-pū'tiks), ***n.pl.*** = psychotherapy.

**psychotherapy** (sī´kō-ther'ə-pi), ***n.*** چارەکردنی نەخۆشی مێشک یا دەروون لەڕێگەی چارەسەرکردنی دەروونییەوە (وەک نواندنی موگناتیسی و شیکردنەوەی نەخۆشییەکە و هۆکانی).

-psychotherapeutic *(adj.)*.

**psychotherapist** (sī´kō-ther'ə-pist), ***n.*** پزیشکی دەروون؛ چارەکەری نەخۆشی دەروون.

**psychotic** (sī-kot'ik), ***adj.*** (١) تایبەت بە نەخۆشی تێکچوونی مێشک یا شێتییەوە. (٢) نەخۆشی مێشکی لەگەڵدایە؛ شێت.

***n.*** مێشک تێکچوو؛ نەخۆشی مێشک یا دەروون؛ شێت.

**psychro-** (sī'krō, sī'krə), پێشگرێکە بەمانای: سارد:

**psychrometer** (sī-krom'ə-tēr), ***n.*** پێوەری شێی هەوا.

**P.T.A., Parent-Teacher Association,** ئەنجوومەنی دایک و باوکان و مامۆستایان.

**ptarmigan** (tär'mə-gən), ***n.*** باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی پۆڕ لە شاخە بەفرینەکاندا دەژی و ڕەنگەکەی بەپێی وەرز دەگۆڕێت.

**pteridology** (ter´ə-dol'ə-ji), ***n.*** سەرخەسناسی.

**pteridophyte** (ter'ə-dō-fīt´), ***n.*** سەرخەس؛ ڕووەکێکی بێ گوڵی بێ تۆوە؛ ڕووەکە سەرخەسییەکان.

**ptero-** (ter'ō, ter'ə), پێشگرێکە بەمانای: پەڕ؛ باڵ:

*( pterodactyl)*

**pterodactyl** (ter´ə-dak't'l, ter´ə-dak'til), ***n.*** خشۆکی باڵدار؛ گیاندارێکی خشۆکی باڵداری قڕتێکەوتووە.

**pteropod** (ter'ə-pod´), ***adj.*** پێ باڵ.

***n.*** گیانداری پێ باڵ: جۆرێکە لە گیاندارە نەرمەکان کە بە هۆی لۆیەکی باڵ ئاساییەوە کە بە پێیەوە بەستراوە مەلە دەکات.

**pterosaur** (ter'ə-sôr´), ***n.*** = pterodactyl.

**-pterous** (tēr-əs), پاشگرێکە بەمانای: باڵدار؛ ئەوەندە باڵی هەیە.

**pterygoid** (ter'ə-goid´), ***adj.*** (١) لە باڵ دەچێ؛ وەک باڵ وایە. (٢) تایبەت بە دوو ئێسقانی کاسەی سەر کە لە شێوەی باڵدان.

***n.*** ئێسقانی وەک باڵ (تونێکاری).

**ptisan** (tiz'ən, ti-zan'), ***n.*** ئاوی جۆ: خواردنەوەیەکە.

**ptosis** (tō'sis), ***n.*** داکەوتنی پێڵووی سەرەوەی چاو بەهۆی خاوبوونەوە یا ووشکبوونەوەی ماسولکەکانییەوە.

**ptyalin** (tī'ə-lin), ***n.*** ئەنزیمێکە لە لیکی مرۆڤ و هەندێ گیانداردا هەیە یارمەتی پەلەخوردکردنی خواردەمەنی دەدات.

**ptyalism** (tī'ə-liz'm), ***n.*** لیکی.

**pub** (pub), ***n.*** [British Slang], مەیخانە؛ بار.

**puberty** (pū'bēr-ti), ***n.*** بلۆق بوون؛ تەمەنی بلۆق بوون.

**pubes** (pū'bēz), ***n.*** (١) تووکەبەر. (٢) بانەگا؛ ناوچەی تووکەبەر.

**pubes** (pū'bēz), ***n.*** *plural of* **pubis.**

**pubescence** (pū-bes''ns), ***n.*** (١) بلۆق بوون؛ گەیشتنە تەمەنی بلۆقی. (٢) گەندەموو؛ نەرمەتووک.

**pubescent** (pū-bes''nt), ***adj.*** (١) بلۆق؛ بالق. (٢) گەندەمووی پێوەیە؛ بە نەرمەتووک داپۆشراوە.

**pubic** (pū'bik), ***adj.*** تووکەبەری؛ تایبەتی بە ئێسقانی بەر مێزەڵدان: *( ~ hair)*

**pubis** (pū'bis), ***n.*** ئێسقانی ناوچەی تووکەبەر یا بەر مێزەڵدان.

**public** (pub'lik), ***adj.*** (١) گشتی؛ کراوەتەوە بۆ هەمووکەس؛ جەماوەری: *( a ~ meeting)*. (٢) گشتی؛ هەمووکەسێک بۆی هەیە یا دەتوانێت بەکاری بهێنێت: *( a ~ park, building, library, etc.)* (٣) بە ناوی گەلەوەیە؛ ڕەسمی: *( a ~ prosecution)*. (٤) گشتی؛ پەیوەندی هەیە بە هەمووکەسەوە: *( the ~ good)*. (٥) ئاشکرا: *( He will make this information ~ .; It is ~ knowledge.)*

***n.*** (١) خەڵک؛ جەماوەر؛ گەل؛ میللەت. (٢) کۆمەڵێکی هاومەبەست یا هاوپیشە: *( the reading ~ )*. (٣) دۆست گەل کەسێکی ناسراو.

in public, بە ئاشکرا؛ لە بەرچاوی خەڵک.

**public address system,** دەزگای بلندگۆی جێگای گشتی.

**publican** (pub'li-kən), ***n.*** (١) باجگر (لە ڕۆمای کۆندا). (٢) [British]، خاوەن میوانخانە یا مەیخانە.

**publication** (pub´li-kā'shən), ***n.*** (١) بڵاوکردنەوە؛ دەنگوباس گەیاندن بە گەل؛ ئاگاداری کردن. (٢) بڵاوکردنەوە (پەڕتووک، گۆڤار، ... هتد)؛

لەچاپدان. (٣) (ا) شتی بڵاوکراوە؛ چاپەمەنی؛ بڵاوکراوە. (ب) پەخشنامە.

**public defender,** پارێزەری گشتی: پارێزەرێکە دادگا دایدەنێ بۆ گومانباری بێ پارێزەر.

**public domain,** (١) زەوی‌وزاری میری؛ زەوی‌وزاری گشتی گەل.
(٢) ماف یا بڕوانامەی داهێنانی هی کەس نییە بەڵکو هی هەموو گەلە:
*( Shakespeare's works are in the ~ .)*

**public enemy,** دوژمنی گەل؛ دوژمنی گشتی.

**public house,** [British], (١) مەیخانە؛ باڕ. (٢) میوانخانە؛ خان.

**publicist** (pub′li-sist), *n.* (١) شارەزای یاسای جیهانی.
(٢) ڕۆژنامەچی کاروباری گشتی.
(٣) لێپرسراوی ڕاگەیاندن‌و جاڕدان‌و پڕوپاگەندە.

**publicity** (pub-lis′ə-ti), *n.* (١) ئاشکرایی
(٢) جاڕ، بانگ بۆ دان؛ ڕاگەیاندن؛ پڕوپاگەندە.
(٣) لەناو خەڵکدا ناسران؛ ناودەرکردن (باش یا خراپ).

**publicize** (pub′li-sīz′), *v.t.* بانگ بۆ دان؛ جاڕ بۆ دان؛ بڵاوکردنەوە: *( to ~ an issue)* .

**publicly** (pub′lik-li), *adv.* بە ئاشکرا؛ لە بەرچاوی خەڵك.

**public opinion,** ڕای گشتی؛ بیروڕای جەماوەر؛ ڕای خەڵك.

**public relations,** پەیوەندی گشتی: دامەزراندن‌و پەرەپێدانی پەیوەندی باش لەنێوان کەسێك، کۆمپانیایەك، دەزگایەك، دەستەیەك، یا گەلێکدا

**public school,** (١) قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و ئامادەیی گشتی (لە ئەمەریکادا). (٢) (ا) قوتابخانەی سەرەتایی گشتی (لە جارانی ئینگلتەرەدا). (ب) قوتابخانەی ئامادەیی تایبەتی بە جێی خواردن‌و نووستنەوە (لە ئێستای ئینگلتەرەدا).

**public servant,** کاربەدەستی میری؛ فەرمانبەر.

**public-spirited** (pub′lik-spir′i-tid), *adj.* بە تەنگ سوودی گشتی‌یەوە هاتوو؛ حەز لە کارێك دەکات کە سوودی گشتی تێدا بێت.

**public utility,** (١) دەزگایەکی تایبەتی‌یە کاردەکات لەپێناو خزمەت کردنی گشتییدا وە لەژێر چاودێری میریدا (وەك دەزگای ئاو، کارەباو هاتوچۆ).
(٢) (*pl.*)، بەشی دەزگایەکی وەهای کڕاو و فرۆشراو لە بازاڕی بۆرسەدا.

**public works,** ئیش‌وکاری گشتی: ئەو پڕۆژانەیە میری دەیکات بۆ سوودی گەل (وەك ڕێگاوبان‌و بەنداو... هتد).

**publish** (pub′lish), *v.t.* (١) بڵاوکردنەوە؛ پەخشکردن.
(٢) بڵاوکردنەوە (پەڕتووك، ڕۆژنامە، گۆڤار)؛ لەچاپدان.

**publisher** (pub′lish-ēr), *n.* بڵاوکەرەوە (مرۆڤ، کۆمپانیای چاپەمەنی).

**puccoon** (pə-ko͞on′), *n.* (١) ڕووەکێکی ئەمەریکی‌یە بۆیەی سوور یا زەردی لێ دەردێت. (٢) ئەم جۆرە بۆیەیە.

**puce** (pūs), *adj.* سووری تۆخ؛ ئەرخەوانی تۆخ.
*n.* ڕەنگی سوور یا ئەرخەوانی تۆخ.

**puck** (puk), *n.* خەپلەی لاستیکی یاری هۆکی (کە لەبری تۆپ بەکاردێ).

**puck** (puk), *n.* جنۆکە؛ دێوودرنج.

**pucka** (puk′ə), *adj.* = **pukka.**

**pucker** (puk′ēr), *v.t. & v.i.* چرچ‌ولۆچ کردن (بەرگ، ناوچەوان)؛ گرژکردن؛ ژاکاندن.
*n.* چرچ‌ولۆچ؛ چرچ؛ گرژی.

**puckery** (puk′ēr-i), *adj.* چرچ‌ولۆچاوی؛ ژاکاو؛ زوو چرچ‌ولۆچی تێ دەکەوێ.

**puckish** (puk′ish), *adj.* بەگوێبەن؛ کەتنباز؛ شەیتان؛ زیانبەخش.

**pudding** (pood′iŋ), *n.* (١) ڕیخۆڵەی پڕکراو لە گۆشتی کوتراو.
(٢) محەللەبی؛ شیرینی‌یەکە وەك محەللەبی.

**puddle** (pud′'l), *n.* (١) چاڵاو (بەتایبەتی هی ئاوی وەستاوی پیسی باراناو یا ڕژاو)؛ گۆلاوی بچووك؛ پەنگاو. (٢) قوڕی گیراوە؛ قوڕوقسڵ.
*v.t.* (١) قوڕاوی کردن؛ لیڵ کردن. (٢) قوڕشێلان؛ قوڕگرتنەوە؛ قوڕوقسڵ گرتنەوە. (٣) ئاوبڕکردن بە قوڕوقسڵ؛ کون گرتن؛ کونبڕکردن.
(٤) گۆڕینی ئاسنی خاو بۆ ئاسنی نەرم یا بەرگەگر.
(٥) زەوی تەڕ کێڵان یا هەڵگێڕانەوە (وەك ئیشکردن لە گۆڵە مەرەزەدا)
*v.i.* خۆ گەوزان لە قوڕدا؛ شڵپەشڵپ یا یاری کردن لە قوڕدا.

**puddler** (pud′lēr), *n.* (١) قوڕشێل؛ قوڕوقسڵ گرەوە.
(٢) ئاسنی خاو شێل یا تێکدەر بۆ نەرم کردنی.

**puddling** (pud′liŋ), *n.* (١) قوڕشێلان؛ قوڕوقسڵ گرتنەوە؛ قوڕگرتنەوە. (٢) ئاسنی خاو کردن بە ئاسنی نەرم یا بەرگەگر.

**puddly** (pud′li, pud′'l-i), *adj.* (١) پڕ لە چاڵاوی پیس.
(٢) لە چاڵاو چوو.

**pudency** (pū′d'n-si), *n.* ئابڕوو؛ شەرم؛ حەیا.

**pudendum** (pū-den′dəm), *n.* (١) قوز؛ دەم‌ولچ‌و کونی قوز.
(٢) (*pl.*)، قوز؛ کێر.

**pudginess** (puj′i-nis), *n.* پان‌وپۆڕی؛ خڕێتی؛ کورتی‌و قەڵەوی.

**pudgy** (puj′i), *adj.* پان‌وپۆڕ؛ خڕین؛ کورت‌و قەڵەو.

**pueblo** (pweb′lō), *n.* (١) دێ (بەتایبەتی هی هیندی‌یەکانی ئەمەریکا)؛ گوند. (٢) [P-]، هیندی ئەمەریکایی.

**puerile** (pū′ēr-il), *adj.* (١) هی کاتی منداڵی.
(٢) منداڵانە؛ هیچ‌وپووچ؛ لە منداڵ دەوەشێتەوە.

**puerility** (pū′ēr-il′ə-ti), *n.* (١) منداڵێتی؛ هیچ‌وپووچی؛ بۆ منداڵ شیان. (٢) کردەوەی منداڵانە.

**puerperal** (pū-ũr′pēr′əl), *adj.* زەیستانی؛ هی کاتی منداڵبوون.

**puerperal fever,** تای زەیستان؛ زەیستانە تا.

**puerperium** (pū′ēr-pêr′i-əm), *n.* ماوەی زەیستانی؛ زەیستانێتی.

**puff** (puf), *n.* (١) (ا) فوو؛ پف؛ مژ. (ب) دەنگی فوو یا پف؛ فیشکە (مەکینە). (ج) نەختێك دووکەڵ یا هەڵمی بەیەك جار دەرهاتوو.
*( ~s of smoke from a pipe)*
(٢) مژ؛ قوم (جگەرە): *( to take a ~ )* .
(٣) ئاوساوی؛ کیف؛ تلۆق. (٤) کولیچەی ئاوساو.
(٥) کیس؛ کیسی ناو ئاخنراو. (٦) قژی بژ؛ تۆپەڵە قژی گیف بووەوە.
(٧) جۆرێکە لە لێفە؛ سەرەخەری ناو ئاخنراو.
(٨) ئیسفەنجی پۆدرە (ئارایشت).
(٩) فشە.
*v.i.* (١) (ا) فیشکەفیشك کردن؛ فیشکاندن. (ب) فووکردن؛ پف کردن؛ دەماندن.
(٢) لێ هاتنەدەرەوە (دووکەڵ، هەڵم):
*( Smoke ~ed up out of the volcano.)*
(٣) هەناسەبڕکێ پێکەوتن؛ هەناسە سواربوون.
(٤) (ا) باکردن؛ هەڵاتن؛ فش بوونەوە؛ گیڤ بوونەوە.
(ب) خۆفشکردنەوە؛ خۆ گیڤ کردنەوە؛ سنگ دەرپەڕاندن:
*( He is all ~ed up.; Be not ~ed up.)*
(٥) مژ یا قوم لە جگەرە دان.
*v.t.* (١) فوولێکردن؛ فوولێکردن‌و کوژاندنەوە: *( to ~ out a candle)* .
(٢) فووتێکردن؛ فشکردنەوە؛ ئاوساندن.
(٣) فووتێکردن (ستایش)؛ دەماندن؛ هەڵدان:
*( He ~ed out his chest with pride.; He ~ed his boss up.)*
(٤) جگەرەکێشان؛ قوم لێدان؛ مژ لێدان: *( to ~ a cigarette)* .
(٥) بژکردنەوە؛ گیڤ کردنەوە.

**puff adder,** ماری خۆ فووتێکەر.

**puff ball,** جۆرە قارچکێکە کە دەستی بەرکەوت دەتەقێ‌و تۆزی لێوە دێتەدەرەوە.

**puffer** (puf′ēr), *n.* (١) فووکەر؛ مژلێدەر. (٢) ماسی خۆ فووتێکەر.

**puffery** (puf′ēr-i), *n.* (١) فشە. (٢) جاڕ یا بڵاوکراوەی پڕ لە فشە.

**puffin** (puf′in), *n.* پەفەن: باڵندەیەکی دەنووك کەڵی ڕەنگاوڕەنگی دەریای باکوورە.

**puffiness** (puf′i-nis), *n.* فش بوونەوە؛ ئاوسان؛ باداری
**puff paste,** هەویری هەڵاتوو (بۆ کولیچەو شیرینی).
**puffy** (puf′i), *adj.* (١) پفەپفکەر؛ پف کردە.
(٢) هەناسەسوار؛ هەناسەبڕکێ پێکەوتوو.
(٣) ئاوساو؛ فووتێکراو؛ بادار. (٤) قەڵەو.
**pug** (pug), *n.* (١) سەگێکی بچووکی تووک کورتی دەموچاو چرچولۆچی لووت کورتو هەڵگەڕاوەی کلك هەڵگەڕاوەیە. (٢) pug nose
**pug** (pug), *v.t.* (١) قوڕشێلان؛ قوڕگرتنەوە.
(٢) بە قوڕ سواغدان؛ بە قوڕوقسڵ سواغدان
(٣) بە قوڕ سواغدان بۆ دەنگبڕکردن.
*n.* (١) قوڕی گیراوە یا شێلراو (بۆ گۆزەودیزەو خشت دروستکردن).
(٢) مەکینەی قوڕشێلان یا گرتنەوە.
**pug** (pug), *n.* [Slang]. = **pugilist.**
**pug** (pug), *n.* شوێن پێی گیاندار.
*v.t.* شوێن پێ هەڵگرتن.
**puggaree** (pug′ə-rē′), *n.* = **puggree.**
**puggree, puggry** (pug′ri), *n.* سەربەستێك یا پارچە پەڕۆیەکە دەبەسترێ بە سەری کڵاوو کڵاوزرێ وە بۆ پاراستنی پشتی مل لە تیشکی خۆر.
**pugilism** (pū′jə-liz′m), *n.* بۆکسبازی
**pugilist** (pū′jə-list), *n.* بۆکسباز
**-pugilistic** *(adj.).*
**pugnacious** (pug-nā′shəs), *adj.* شەڕانی؛ دڕ؛ شەڕفرۆش
**pugnacity** (pug-nas′ə-ti), *n.* شەڕەنگێزی؛ دڕی؛ شەڕفرۆشی
**pug nose,** لووتی کورتو پانو هەڵگەڕاوە؛ لووتی قوت.
**pug-nosed** (pug′nōzd′), *adj.* لووت کورتو پانو هەڵگەڕاوە؛ لووت قوت
**pugree** (pug′ri), *n.* = **puggree.**
**puisne** (pū′ni), *adj.* پلە کەمتر (دادگەری).
*n.* دادپرسی نوێ یا یاریدەدەر.
**puissance** (pū′i-s′ns, pwis′′ns), *n.* [Arch. or Poetic]. هێز؛ بازوو؛ دەسەڵات
**puissant** (pū′i-s′nt, pū-is′′nt, pwis′′nt), *adj.* بەهێز؛ بەدەسەڵات
**puke** (pūk), *n., v.i. & v.t.* ڕشانەوە
**pulchritude** (pul′krə-tōōd′, pul′krə-tūd′), *n.* جوانی؛ جوانی ڕووخسارو لەشولار
**pule** (pūl), *v.i.* کڕووزانەوە؛ نووزەنووزکردن.
**pull** (pool), *v.t.* (١) ڕاکێشان؛ ڕاتەکاندن؛ بەکێش کردن؛ ڕاپسکاندن.
(٢) (ا) هەڵکەندن؛ هەڵکێشان؛ دەرکێشان؛ دەرهێنان: *( He had two teeth ~ed.)*
(ب) کردنەوە؛ لێکردنەوە؛ ڕنین: *( She ~ed several roses.)* .
(٣) دڕاندن؛ لێکردنەوە: *( The seam of her dress is ~ed.)* .
(٤) کشاندن.
(٥) لە جێ بردن؛ ڕاتەکانو ئازاردان: *( He ~ed a muscle in the game.)*
(٦) [Colloq.]، پێ هەڵسان؛ کردن: *( They ~ed a raid, robbery, etc.)*
(٧) [Dial. or Rare]، ڕیخۆڵەی باڵندە دەرهێنان.
(٨) [Colloq.]، ڕاگرتن؛ دەست کێشانەوەو ئیتر لێ نەدان: *( He's ~ing his punches.)*
(٩) [Slang]. (ا) گرتن (بەندیخانە)
(ب) هێرش بردنەسەر لەلایەن پۆلیسەوە.
(١٠) لێدانی تۆپێك بۆ لای چەپ (یاری بێسبۆڵو گۆڵف).
(١١) جڵەوگرتنی ئەسپ بۆ نەبردنەوەی غارغارێن
(١٢) وێنە لەسەر دەرهێنان (چاپەمەنی).
(١٣) (ا) سەوڵ لێدان بۆ لای خۆوە. (ب) گواستنەوە بە سەوڵ لێدان.
*v.i.* (١) ڕاکێشان؛ بەکێش کردن.
(٢) قومێکی گەورە لێدان؛ مژێکی باش لە جگەرە دان. (٣) ڕاکێشران.
(٤) ڕۆیشتن؛ چوونەدەرەوە.
*n.* (١) ڕاکێشان؛ بەکێش کردن؛ ڕاتەکان. (٢) سەوڵ لێدان. (٣) قوم.
(٤) مژ (جگەرە). (٥) هێزی پیاهەڵگەڕان؛ ئەرکی هەڵگەڕان.
(٦) ئەرکێکی گرانی بەردەوام؛ هەوڵی بەردەوام.
(٧) لێدانی تۆپ بۆ لای چەپ (بێسبۆڵ، گۆڵف).
(٨) شتی ڕاکێشراو وەك دەسکی چەکمەجە.
(٩) [Slang]، دەسەڵات؛ دەسەڵاتی کارکردنە سەر بوونو نەبوون یا کردنو نەکردنی شتێك: *( Do you have any ~ with the manager?)* .
**pull a fast one, [Slang],** فێڵ کردن؛ ساختەکردن؛ گزی کردن.
**pull apart,** (١) ڕەخنەلێگرتن.
(٢) پارچە پارچە کردن؛ لەیەك جیاکردنەوە؛ لەیەك ترازاندن؛ شیکردنەوە.
**pull down,** (١) ڕووخاندن؛ ڕماندن.
(٢) شکاندن؛ ڕیسواکردن؛ لووت شکاندن.
(٣) کەمکردنەوە.
**pull for, [Colloq.],** هاندان (تیپی یاری)؛ چەپڵە بۆ لێدانو هاندانو داوای سەرکەوتن کردن: *( They were pulling for their football team.)*
**pull off, [Colloq.],** هێنانەدی؛ کردن؛ تێدا سەرکەوتوو بوون؛ بەجێهێنان: *( to pull off a robbery.)* .
**pull oneself together,** غیرەت هێنانەوە بەر خۆ؛ هێز هێنانەوە بەر خۆ؛ هێمن بوونەوە؛ خۆ گورج کردنەوە.
**pull one's leg,** گاڵتە لەگەڵ کردن: *( Are you pulling my leg?)* .
**pull one's teeth,** ددان دەرهێنان (مەجاز)؛ واڵێکردن کە ئیتر نەتوانێت زیاد بکات.
**pull one's weight,** بەشی خۆ ئیشکردن، یارمەتیدان، یا پارە دان.
**pull out,** کێشانەوە؛ خۆ کێشانەوە.
**pull over, [Colloq.],** لادانە قەراغی ڕێگەو ڕاوەستاندنی ئوتومبێل؛ هێنانە لاوەو وەستاندن: *( I pulled over because of a flat tire.; The policeman pulled him over.)*
**pull punches,** بە هەموو هێزی خۆ لێ نەدان؛ خۆڕاگرتنو لێ نەدان.
**pull things,** کارکردنە سەر ئەنجامی کارێك یا مەسەلەیەك بە زۆر بێ یا بە خوایشت لەگەڵ ئەوانەی کارەکەیان بەدەستە.
**pull the rug from under,** بەڕە لەژێر پێدا ڕاکێشان؛ پشت تێکردن.
**pull the wool over one's eyes,** چاو بەستنەوە؛ چاوبەستکردن؛ هەڵخەڵەتاندن.
**pull through, [Colloq.],** زاڵبوون بەسەر گیروگرفتێکدا؛ چاکبوونەوە لە نەخۆشییەك؛ سەرکەوتن بەسەر کۆسپێکدا.
**pull together,** هاوکاری کردن؛ یەککگرتنو یارمەتی یەکتری دان.
**pull up,** (١) لە ڕەگ دەرهێنان؛ هەڵکەندن؛ هەڵکێشان.
(٢) ڕاوەستاندن (لێخوڕی ئوتومبێل لەبەر هەڵەکردن)؛ لادانە قەراغی ڕێگەو وەستان؛ وەستان: *( I pulled up to check my tires.; The highway patrol pulled her up.)*
(٣) پێ گەیشتنەوە (پێشبڕکێ).
**pullback** (pool′bak′), *n.* (١) کێشانەوە (لەشکر)؛ کشانەوە.
(٢) کۆسپ؛ ڕاگیرکەر. (٣) ئامێری ڕاکێشان.
**pullet** (pool′it), *n.* باڕۆکە؛ فڕووج.
**pulley** (pool′i), *n.* خولخولۆکە؛ بەکرە.
**Pullman car,** فارگۆنێکی شەمەندەفەرە ژووری نووستنی تێدایە. (پێشی دەووترێ: " Pullman " )
**pull-out** (pool′out′), *n.* (١) کێشانەوە (لەشکر)؛ کشانەوە: *( a ~ of troops)*

(۲) ڕاستکردنەوەی فڕۆکەو بە ڕێکی فڕین پاش سەربەرەوخوار فڕین.
(۳) شتێکە کە وا دروست کراوە ڕاکێشرێتە دەرەوە.

**pull-over** (pool′ō′vẽr), *n.* بلووسێکی بێ قۆپچەیە بەسەردا لەبەر دەکرێ.
*adj.* بەسەردا لەبەردەکرێت.

**pullulate** (pul′yoo-lāt′), *v.i.* (۱) چەکەرەکردن؛ ڕووان؛ پشکوتن.
(۲) زوو زاوزێ کردن؛ زۆر زاوزێ کردن؛ بەچکە زۆر بوون.
(۳) پڕبوون لە؛ تێچڕان؛ زۆربوون؛ زۆر زۆر بوون؛ زۆر پەرەسەندن.
**-pullulation** *(n.).*

**pull-up** (pool′up′), *n.* مناوەرەیەکە بریتییە لە کتوپڕ بەرەو ژوور فڕینی فڕۆکە بۆ ماوەیەکی کورت پاش بە ڕێکی فڕین.

**pulmonary** (pul′mə-ner′i), *adj.* (۱) تایبەتی بە سی؛ هی سییەکان. (۲) ئەندامی وەك سی هەیە.
(۳) خوێنبەرو خوێنهێنەری سی.

**pulmonate** (pul′mə-nāt′, pul′mə-nit), *adj.* (۱) سی یا ئەندامی وەك سی هەیە. (۲) تایبەتی بەو کۆمەڵە گیاندارە نەرمانەی کە ئەندامێکی وەك سی یا کیسێکی هەوایییان هەیە وەك قاقلەو شەیتانۆکەی باخچە.
*n.* گیاندارێکی ئەم کۆمەڵەیە.

**pulmonic** (pul-mon′ik), *adj.* (۱) pulmonary.
(۲) پزوویی؛ تایبەتی بە نەخۆشی سی.

**pulmotor** (pul′mō′tẽr, pool′mō′tẽr), *n.* ئامێری هەناسەدان؛ بۆ ئەوانەی نزیکی مردنن بە هۆی خنکانەوە؛ هەناسەپێدەر.

**pulp** (pulp), *n.* (۱) تلپە؛ تلپەی میوە پاش گوشینی (وەك ترێ، سێو... هتد). (۲) گۆشتی میوە. (۳) ناوەڕۆکی قەفی ڕووەك.
(٤) کانزای خاوی هاڕراوی تێکەڵ کراو لەگەڵ ئاو.
(٥) تلپە یا هەویری وەك کاغەز: تلپەی دارو پەڕۆو شتی وەها کە کاغەزی لێ دروست دەکرێت. (٦) *(pl.)* ،[Slang]، ئەو گۆڤار یا پەڕتووکانەن کە لەسەر کاغەزی زبر چاپ دەکرێن‌و باسی وورووژێنەریان تێدایە.
*v.t.* (۱) کردن بە تلپ یا مەعجوون؛ وەك تلپ لێکردن.
(۲) گۆشت یا ناوەڕۆك لێ دەرهێنان.
*v.i.* بوون بە تلپ؛ وەك تلپ لێهاتن.

**pulpit** (pool′pit), *n.* (۱) دووانگە (کڵێسە، مزگەوت).
(۲) قەشە گەل؛ مەلا گەل. (۳) ئامۆژگاری ئاینی‌و ڕەوشتی کردن.

**pulpous** (pul′pus), *adj.* = **pulpy.**

**pulpwood** (pulp′wood′), *n.* (۱) نەرمەداری کاغەز دروستکردن (وەك سپیدارو سنەوبەر). (۲) تلپە دار (بۆ کاغەز دروستکردن).

**pulpy** (pul′pi), *adj.* گۆشتن (میوە)؛ تلپەیی؛ خەست‌وخۆڵ.
**-pulpiness** *(n.).*

**pulsate** (pul′sāt), *v.i.* (۱) لێدان (دڵ)؛ پلدان: *( The heart ~s.)* .
(۲) پلدان (مەجاز)؛ مووچڕکە پیاهاتن: *( The city ~s with life.)* .
(۳) لەرزین

**pulsatile** (pul′sə-t′l, pul′sə-til), *adj.* (۱) لێدەدات (دڵ).
(۲) لێدەدرێ (تەپڵ).

**pulsation** (pul-sā′shən), *n.* (۱) دڵ لێدان
(۲) پرتە؛ لێدانێکی دڵ.

**pulsator** (pul-sā′tẽr), *n.* پرتەکەر (ئامێر، مەکینە)؛ لێدەر وەك دڵ.

**pulsatory** (pul′sə-tôr′i, pul′sə-tō′ri), *adj.* پرتەکەر؛ بە ڕێك‌وپێکی لێدەدات.

**pulse** (puls), *n.* (۱) دڵ لێدان. (۲) پرتە؛ پل؛ لێدانێکی دڵ.
(۳) لێدانی ڕێك‌وپێکی وەك دڵ.
(٤) هەست‌و ئارەزووی شاراوەی کۆمەڵێك: *( the ~ of the electorate)* .
(٥) پرتە (کارەبا).
*v.i.* لێدان (دڵ)؛ پلدان.

**pulse** (puls), *n.* (۱) دەنك یا تۆوی ناو کەلوو (پاقلە، فاسۆلیا، نۆك، نیسك). (۲) ڕووەکی کەلوودار.

**pulsimeter** (pul-sim′ə-tẽr), *n.* پێوەری لێدانی دڵ.

**pulsometer** (pul-som′ə-tẽr), *n.* (۱) تروومپای ئاو سەرخستن.
(۲) **pulsimeter** .

**pulverable** (pul′vẽr-ə-b′l), *adj.* = pulverizable.

**pulverizable** (pul′və-rīz′ə-b′l), *adj.* دەهاڕرێت؛ دەشێت بهاڕرێت.

**pulverization** (pul′vẽr-ī-zā′shən), *n.* (۱) وورد وخاش کردن؛ هاڕین. (۲) وێرانکردن؛ ڕووخان.

**pulverize** (pul′və-rīz′), *v.t.* (۱) هاڕین؛ وورد وخاش کردن؛ کوتان؛ کردن بە تۆز. (۲) وێرانکردن؛ ڕووخاندن؛ تەخت‌وتاراج تێکدان.
*v.i.* بوون بە تۆز؛ هاڕران.

**pulverulent** (pul-ver′yoo-lənt), *adj.* (۱) تۆزاوی؛ تۆزی پێوەیە.
(۲) تۆزی؛ لە تۆز پێکهاتوو. (۳) بە ئاسانی دەپروێ؛ دەپروێنرێ.

**pulvillus** (pul-vil′əs), *n.* گۆشتی ئیسفەنجی پێی جانەوەر.

**pulvinate** (pul′vi-nāt′), *adj.* (۱) ئیسفەنجی؛ نەرم.
(۲) بن ئاوساو (لاسکی گەڵا)

**pulvinus** (pul-vī′nəs), *n.* ئاوساوی بنی لاسکی گەڵا

**puma** (pū′mə), *n.* (۱) پڵنگی ئەمەریکی. (۲) کەوڵی ئەم گیاندارە.

**pumice** (pum′is), *n.* بەردەپێ: بەردێکی ڕەشی سووکی کون کونە بۆ پاکردنەوەو ساف‌ولووس کردن بەکاردەهێنرێ.

**pummel** (pum′′l), *n.* = **pommel.**

**pump** (pump), *n.* تروومپا؛ پەمپ.
*v.t.* (۱) ئاو سەرخستن بە تروومپا؛ ئاو یا شلەی تر دەرهێنان بە تروومپا.
(۲) ئاو لێ دەرهێنان؛ ئاو لێ دەرکردن. (۳) فووتێکردن؛ فشکردنەوە.
(٤) بەرزو نزم کردنەوەو ڕژان.
(٥) قسە لێ دەرهێنان؛ دەنگوباس لێ دەرکێشان: *( to ~ a witness for information)*
*v.i.* (۱) تروومپا بەکارهێنان. (۲) ئاو سەرخستن یا دەرهێنان بە تروومپا.
(۳) بەرزو نزم کردن وەك دەسکی تروومپا.

**pump** (pump), *n.* پێڵاوی بێ قەیتان

**pumpernickel** (pum′pẽr-nik′l), *n.* نانی حەوێنج.

**pumpkin** (pump′kin), *n.* (۱) کوولەکە. (۲) ڕووەکی کوولەکە.

**pumpkinseed** (pump′kin-sēd′, puŋ′kin-sēd′), *n.* (۱) ناوکە کوولەکە؛ دەنکە کوولەکە. (۲) جۆرە ماسییەکی ناو ڕووبارە.

**pun** (pun), *n.* یاری کردن بە ووشە (لەڕووی گاڵتەوە)؛ یاری کردن بە مانای جیا جیای هەمان ووشە یا بە ماناو دەنگی چوونیەکی ووشەی جیاواز (بۆ گاڵتە).
*v.i. & v.t.* ( ~ **on** ), یاری کردن بە ووشەو مانای (لەڕووی گاڵتەوە).

**punch** (punch), *n.* (۱) ئامێری کونکردن: *( a leather ~ ; a paper ~ )*
(۲) ئامێری بزمار لێدان یا دەرهێنان (بەتایبەتی کە بزمارەکە لەناو ڕوویەکدا نوقم بکات). (۳) ئامێری کلێشە دان لە ڕوویەك؛ ئامێری وێنە هەڵکەندن یا دەرهێنان لەسەر ڕوویەك؛ ئیستەمپا؛ دامغە؛ مۆر.
*v.t.* کون تێکردن؛ کونکردن: *( to ~ a hole in a piece of paper or leather)*

**punch** (punch), *v.t.* (۱) نەقیزە تێوەژەندن؛ دار تێوەژەندن.
(۲) ئاژەڵ لێخوڕین بە نەقیزە. (۳) مستەکۆڵە لێدان؛ بۆکس لێدان.
*n.* (۱) مستەکۆڵە؛ بۆکس. (۲) [Colloq.] ، تین؛ هێز.
**pull no punches,** [Slang], (۱) بە هەموو هێز مستەکۆڵە لێدان.
(۲) بە هەموو هێزی خۆ لێدان یا هێرش بردنە سەر؛ هیچ تێدا نەهێشتنەوە
**pull one's punches,** [Slang], (۱) بە هەموو هێز مستەکۆڵە لێ نەدان.
(۲) بە هەموو هێز لێ نەدان یا ڕەخنە نەکردن؛ شتێك تێدا هێشتنەوە.

**punch** (punch), *n.* خواردنەوەیەکی تێکەڵاوی ئاوی لیمۆو پرتەقاڵ‌و میوەی ترە گەلێك جار لەگەڵ شەراب‌و خواردنەوەی کحولی تریشدا.

**punch-drunk** (punch′druŋk′), *adj.* (١) مێشکی تێکچووه بە مستەکوڵە: بە مستەکوڵە وورکراوە. (٢) [Colloq.]، وورد.

**punched card,** کارتی کون کونو نەخشە کراو (بۆ پێژمێن).

**puncheon** (pun′chən), *n.* (١) کۆڵەکەی کورت و ئەستوور (بەتایبەتی هی کانگە). (٢) مووڕەداری پانو یەك لا ساف کراو (٣) مۆری ڕەڕەنگەر.

**puncheon** (pun′chən), *n.* (١) بەرمیلی گەورە (کە ٧٢- ١٢٠ گالۆن بگری) (٢) پڕ بەرمیلێکی وەها

**punch in,** تۆمارکردنی کاتی ئیش دەستپێکردنی کرێکار بە کاتژمێرێکی مۆردار لەسەر کارتێك.

**punchinello** (pun′chə-nel′ō), *n.* (١) گاڵتەچی کورتەباڵای قەڵەوی پشت کۆمی لووت نووشتاوەی نمایشی بیجبیجە خانمی ئیتاڵی. (٢) کەسێکی کورتەباڵای قەڵەوی ناشرین.

**punching bag,** توورەکەی مستەکوڵە لێدان توورەکەیەکی ناو ئاخنراو یا فووتێکراوی هەڵواسراوە بۆ مەسقی بۆکسبازی.

**punch line,** ووتەی مەبەست: ئەو ووتەیە کە مەبەستی نوکتەیەك دەدات بەدەستەوە.

**punch out,** تۆمارکردنی کاتی دەست لە ئیش هەڵگرتنی کرێکار بە کاتژمێرێکی مۆردار لەسەر کارتێك.

**punch press,** پەستێنەری کونکردن (مەکینەکاری).

**punctate** (puŋk′tāt), *adj.* خاڵ خاڵدار: بەنەك: پەڵە پەڵاوی.

**punctated** (puŋk′tā-tid), *adj.* = punctate.

**punctation** (puŋk-tā′shən), *n.* (١) خاڵ خاڵاویتی: خاڵ خاڵێتی (٢) خاڵ (٣) خاڵ خاڵ کردن. (٤) بەیاننامەیەکی لە چەند خاڵێك پێکهاتوو

**punctilio** (puŋk-til′i-ō′), *n.* (١) خاڵێکی بچکۆلەی نەزاکەت یا ڕەووشت جوانی (٢) ڕەووشتی جوان خوازی: پەیڕەوی کردنی دەستووری ڕەووشت یا نەزاکەتی.

**punctilious** (puŋk-til′i-əs), *adj.* (١) ڕەووشت جوان: بە نەزاکەت: زۆر بایەخدەر بە دەستووری ڕەووشت: ڕەووشتخواز. (٢) وورد: ووردکار: زۆر بایەخدەر بە شتی بچووك

**punctual** (puŋk′chōō-əl), *adj.* (١) زۆر بچووك: وورد (٢) punctilious. (٣) لە ژووان دوا نەکەوتوو: لە کاتی خۆیدا دەیکات: دوا ناکەوێ: لە کاتی پێویستدا کراو.

-punctuality *(n.)*.

**punctuate** (puŋk′chōō-āt′), *v.t.* (١) خاڵبەندی کردن: خاڵ‌وبۆر بۆ دانان (٢) ناوبەناو پێ بڕین: *( lectures ~d by questions and discussions)* (٣) دووپاتکردنەوە

*v.i.* نیشانەی خاڵبەندی بەکارهێنان

**punctuation** (puŋk′chōō-ā′shən), *n.* (١) خاڵبەندی کردن: خاڵ‌وبۆر بۆ دانان (٢) خاڵبەندی: خاڵ‌وبۆر.

**punctuation mark,** نیشانەی خاڵبەندی (وەك: خاڵ، جووت خاڵ، کەوانە، نیشانەی پرسیار... هتد).

**puncture** (puŋk′chẽr), *n.* (١) کونکردن. (٢) پەنچەر (تایەی ئوتومبیل، پاسکیل... هتد).

*v.t.* (١) پەنچەرکردن: کون تێکردن و فشکردنەوە: *( to ~ a tire)*. (٢) فشکردنەوە: هەرەس پێ هێنان: تەپاندن: *( His pride was ~d.)*.

*v.i.* پەنچەربوون: فش بوونەوە: تەپین: هەرەس هێنان.

-puncturable *(adj.)*.

**pundit** (pun′dit), *n.* (١) زانای هیندی: زانا. (٢) زانا (لەڕووی سووکی یا گاڵتەپێکردنەوە)

**pung** (puŋ), *n.* [Dial.]. گالیسکە بەفرینەی یەك ئەسپی.

**pungent** (pun′jənt), *adj.* (١) تیژ (تام، بۆن): *( a ~ smell, taste, etc.)* (٢) نووك تیژ: بڕ: بەئازار. (٣) توندوتیژ: تیژ (زمان): بڕ (ڕەخنە): *( ~ satire, language, etc.)*. (٤) زاخاوی مێشك دەرەوە: خەوڕەوێن.

-pungency *(n.)*; pungently *(adv.)*.

**puniness** (pū′ni-nis), *n.* کەمی: بچووکی: هیچ‌وپووچی: بێ بایەخی.

**punish** (pun′ish), *v.t.* (١) سزادان (تاوانبار): سزا بەسەردا دان. (٢) ئازاردان: بە توندوتیژی لەگەڵدا جوڵانەوە. (٣) هیچ تێدا نەهێشتنەوە (ئازووقە).

*v.i.* سزا بەسەردا دان.

**punishable** (pun′ish-ə-b'l), *adj.* شایانی سزادانە: سزا دەدرێ: دەشێت سزا بدرێت: *( a ~ offense)*.

**punishment** (pun′ish-mənt), *n.* (١) (ا) سزادان. (ب) سزادران. (٢) سزا. (٣) [Colloq.]، بە توندوتیژی لەگەڵدا جوڵانەوە.

**punitive** (pū′nə-tiv), *adj.* تایبەت بە سزا: بۆ سزادان یا تەمێ کردنە.

-punitively *(adv.)*; punitiveness *(n.)*.

**Punjabi** (pun-jä′bi), *n.* (١) پەنجابی: هاوڵاتییەکی ناوچەی پەنجابی هیندی. (٢) زمانی پەنجابی.

**punk** (puŋk), *n.* پووشوو: قاو.

**punk** (puŋk), *n.* (١) [Obs.]، قەحبە. (٢) [Slang] (ا) حیز. (ب) شەلاتی هەرزە. (ج) گەنجێکی نەزانی هیچ‌وپووچ: کەسێکی نالەبار.

*adj.* [Slang]. گەنگ: ڕەشۆکی: قەلب.

**punkah, punka** (puŋ′kə), *n.* پانکە.

**punkie** (puŋ′ki), *n.* مێشێکی بچکۆلەی گازگری ناوچە شاخاوییەکانی ئەمەریکایە.

**punkin** (puŋ′kin), *n.* [Dial.], = pumpkin.

**punster** (pun′stẽr), *n. Also* **punner,** یاری بە ووشە کەر: یاریکەر بە مانا و دەنگی جیا جیای ووشە.

**punt** (punt), *n.* شەق تێهەڵدانی تۆپ پاش لەدەست بەردانەوەی و پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی (یاری فووتبۆڵێنی ئەمەریکی).

*v.t. & v.i.* شەق تێهەڵدانی تۆپ بەم جۆرە.

**punt** (punt), *n.* بەلەمێکی یەك سەوڵی بن تەختی ئەمسەرو ئەوسەر ڕێکە.

*v.t.* (١) سەوڵ لێدانی ئەم جۆرە بەلەمە لە ڕووباری تەنگاودا بە گیرکردنی سەوڵەکە لە بنی ڕووبارەکە. (٢) هەڵگرتن لەم جۆرە بەلەمەدا.

*v.i.* سواربوونی ئەم جۆرە بەلەمە.

**punt** (punt), *v.i.* قومارکردن.

**punty** (pun′ti), *n.* شیشی شووشەچی: شیشێکی ئاسنە شووشەی لەسەر درووست دەکرێ.

**puny** (pū′ni), *adj.* (١) کەم: بچووك: هیچ‌وپووچ: بێ بایەخ. (٢) [Obs.]، puisne.

**pup** (pup), *n.* (١) تووتکە سەگ: بەچکە سەگ: تووتك: توولە. (٢) بەچکەی مانگای دەریا.

*v.i.* ترەکین.

**pupa** (pū′pə), *n.* بەچکە مێروو: کرمۆکەی ناو قۆزاخە.

**pupal** (pū′p'l), *adj.* تایبەت بە قۆناغی نێوان کرمۆکەو مێرووی تەواو.

**pupate** (pū′pāt), *v.i.* گەیشتنە قۆناغی نێوان کرمۆکەو مێرووی تەواو.

-pupation *(n.)*.

**pupil** (pū′p'l), *n.* (١) قوتابی سەرەتایی: قوتابی منداڵ. (٢) هەرزەی بیست‌ویەك ساڵ کەمتری ژێر چاودێری کەسێکی گەورە.

**pupil** (pū′p'l), *n.* بیلبیلەی چاو.

**pupilage** (pū′p'l-ij), *n.* قوتابییەتی سەرەتایی: کاتی قوتابییەتی سەرەتایی.

**pupillary** (pū′pə-ler′i), *adj.* تایبەت بە قوتابی قۆناغی سەرەتایی.

**pupillary** (pū′pə-ler′i), *adj.* تایبەت بە بیلبیلەی چاو.

**puppet** (pup′it), *n.* (١) بیجبیجە خانم: بووکە سەماکەرە.

(۲) گومان دەربڕین؛ گومان لێ بوون؛ دوودڵی دەربڕین.
(۳) گومان دەربڕین (بە دانانی نیشانەی پرسیار لە دوای شتێکەوە)؛
دانانی ئەم نیشانەی پرسیارە لە دوای ووتەیەکی گومان لێکراوەوە.
***v.i.*** (۱) پرسیارکردن (۲) گومان دەربڕین؛ گومان بوون.
**quest** (kwest), ***n.*** (۱) بۆ گەڕان؛ بە دوادا گەڕان؛ ڕاو؛ گەڕان بە دوای
خواستێك یا ئاواتێكدا: ***(the ~ for knowledge, gold, etc.)***.
(۲) گەشتێکە بە دوای خواستێکدا یا گێچەڵدا (وەك هی سوارچاکانی سەدانی
ناوەڕاست) (۳) ئەوانەی بەشداری ئەم گەشتە دەبن.
(٤) [Rare]، لێکۆڵینەوە (دادگەری).
***v.i.*** (۱) شوێن پێ هەڵگرتن (تانجی): ***(dogs ~ing for rabbits)***.
(۲) [Rare]، بە شوێندا گەڕان؛ بۆ گەڕان.
**in quest of,** بۆ گەڕان؛ بە دوادا؛ بە شوێندا گەڕان:
***(He went in quest of food.)***
**question** (kwes′chən), ***n.*** (۱) پرسیار؛ پرس.
(۲) گومان؛ دوودڵی؛ نادڵنیایی: ***(There is no ~ of his veracity.)***.
(۳) مەسەلە یا داوایەکی بەردەم دادگا.
(٤) مەسەلە؛ کێشە؛ باس؛ گیروگرفت:
***(The ~ of self-determination for minorities)***
(٥) مەسەلەی باسکراو لە کۆڕێك یا پەرلەمانێکدا.
(٦) شێوەی هێنانە پێشەوەی مەسەلەیەك بۆ دەنگ لەسەر دان لە کۆڕێکدا.
***v.t.*** (۱) پرسیارکردن؛ پرس کردن.
(۲) گومان لێکردن؛ دوودڵی لێکردن:
***(I ~ whether his policy will be successful.)***
(۳) پرسیار لێکردن بە ووردی (دادگا، پۆلیسخانە):
***(He was ~ed by the police.)***
***v.i.*** پرسیارکردن.
**beside the question,** پەیوەندی نییە بە باسەکەوە؛ پەیوەندی نییە.
**beyond (all) question,** هیچ گومانی تێدا نییە؛ هیچ ناکۆکییەك نییە
دەربارەی
**call into question,** (۱) گومان لێکردن؛ دوودڵی دەربڕین دەربارەی:
***(His integrity was called into question.)***
(۲) داوای لێدووان و لێکۆڵینەوە کردن.
**in question,** ناوبراو؛ ئەوەی باسی لێ دەکرێت:
***(Where is the man in question?)***
**out of the question,** هەر نابێ؛ هەر باسیشی مەکە؛ هەرگیز نابێ؛
کاری نەکردە؛ لێدووان هەڵناگرێ:
***(Inviting him to the meeting is out of the question.)***
**questionable** (kwes′chən-ə-b'l), ***adj.*** (۱) جێی گومانە؛
نامسۆگەر؛ گومانی تێدایە (ئەنجام).
(۲) گومانی لێ دەکرێت (ناوبانگ، ڕاستێتی، سەرڕاستی)؛ چەوت:
***(a ~ person, tactic, motive, etc.)***
**questionary** (kwes′chən-er′i), ***n.*** = questionnaire.
**question mark,** نیشانەی پرسیار ( ؟ )؛ پرسەك.
**questionnaire** (kwes′chən-âr′), ***n.*** پرسیارنامە؛ پرسنامە.
**queue** (kū), ***n.*** (۱) پرچ (۲) ڕیز؛ ڕیزە خەڵك (بۆ نۆبەگرتن).
***v.i.* (~ up),** ڕیزبوون؛ نۆبەگرتن؛ ڕیزگرتن (بۆ نۆبەگری).
**quibble** (kwib′'l), ***n.*** (۱) pun (۲) خۆبەدەستەوەنەدان لە گفتوگۆدا
(بە سەرنج ڕاکێشان بۆ شتی هیچوپووچ و مانای جیا جیای قسە)؛ ئاینوئۆین.
(۳) ڕەخنەی هیچوپووچ؛ پەڵپی بێ مانا.
***v.i.*** (۱) خۆبەدەستەوەنەدان لە گفتوگۆدا (بە سەرنج دان بە شتی هیچوپووچ و
مانای جیا جیای قسە)؛ پەڵپ و ڕەخنەی هیچوپووچ گرتن و مشتومڕ کردن
لەسەر شتی ناگرنگ؛ ئاینوئۆین کردن: ***(Let's not ~ about details.)***.
(۲) pun
**quick** (kwik), ***adj.*** (۱) [Archaic]، زیندوو.
(۲) (أ) خێرا؛ گورج وگۆڵ؛ گورج: ***(a ~ walk)***
ب) زوو کراو؛ خێرا؛ بەدەست وبرد؛ گورج: ***(a ~ reply)***.
(۳) سەرپێیی؛ پەلە؛ خێرا: ***(a ~ look, visit, etc.)***.
(٤) زیرەك؛ وریا؛ مێشك تیژ: ***(a ~ mind)***.
(٥) هەست تیژ؛ هەستیار: ***(a ~ sense of smell)***.
(٦) چاپك؛ بەهەڵپە؛ وریا.
(۷) زوو هەڵدەچێت؛ سەرگەرم: ***(He has a ~ temper.)***.
(۸) سکپڕ؛ بە سك؛ ئاووس.
***adv.*** خێرا؛ بە خێرایی؛ بە پەلە.
***n.*** (۱) زیندووان؛ زیندوو: ***(the ~ and the dead)***.
(۲) گۆشتی ژێر نینۆك؛ شوێنی ناسك؛ ناوجەرگە؛ ناوکرۆکی هەست:
***(Her sarcasm cut him to the ~.)***
***v.t.*** [Archaic], بزواندن؛ زیندووکردنەوە؛ وریاکردنەوە.
-quickness ***(n.)***.
**quick assets,** پارەی دەستی و ئەو سەرمایەیەی کە دەتوانرێت زوو
بفرۆشرێ و بکرێ بە پارە
**quicken** (kwik′ən), ***v.t.*** (۱) هێنانەوە هۆش خۆ؛ وریاکردنەوە؛
زیندووکردنەوە (۲) بزواندن؛ جووڵاندن؛ وورووژاندن.
(۳) پەلەلێکردن؛ پەلەکردن؛ خێراکردن: ***(to ~ the pace)***.
***v.i.*** (۱) هۆش هاتنەوە بەر خۆ؛ وریابوونەوە؛ زیندووبوونەوە.
(۲) جووڵانەوەی ئاوڵەمە لە سکی دایکیدا؛
گەیشتنە ئەو قۆناغەی سکپڕی کە ئاوڵەمە بجووڵێتەوە و نیشانەی ژیان
پیشان بدات.
(۳) خێراتربوون؛ خێرابوون؛ گورجتربوون: ***(The pulse ~s with fear.)***
**quick-fire** (kwik′fīr), ***adj.*** خێرا دەیتەقێنێت (چەکی ئاگرین).
**quick fire,** گوللەی خێراو یەك لە دوای یەك تەقێنراو.
**quick-freeze** (kwik′frēz′), ***v.t.*** خواردەمەنی خێرا بەستن (بۆ
پاراستنی تامەکەی)
**quickie** (kwik′i), ***adj.*** [Slang], کاری سەرپێیی؛
کاری پەلە (بەتایبەتی فیلمی سینەما).
**quicklime** (kwik′līm′), ***n.*** قسڵ؛ قسڵی زیندوو.
**quickly** (kwik′li), ***adv.*** (۱) خێرا؛ گورج؛ بە پەلە؛ بە گورج وگۆڵی؛
بە خێرایی (۲) زوو بە زوو؛ بە زوویی؛ زوو؛ بەم زووانە.
**quicksand** (kwik′sand′), ***n.*** لمی فشەڵ (کە بە ئاسانی پێی تێدا
دادەچێ).
**quickset** (kwik′set′), ***n.*** (۱) قەڵەمی ڕووەکێکە دەنێژرێ بۆ پەرژین.
(۲) پەرژینی قەڵەمی وەها.
**quicksilver** (kwik′sil′vẽr), ***n.*** جیوە.
***adj.*** جیوەیی؛ حولحولی؛ ڕاڕا.
**quick-step** (kwik′step′), ***n.*** (۱) هەنگاوی خێرا (ڕۆیشتنی سەرباز
بە ڕیز)؛ ڕەوتی خێرا (۲) مۆسیقای ئەم جۆرە ڕۆیشتنە.
(۳) هەنگاوی خێرای سەما.
**quick-tempered** (kwik′tem′pẽrd), ***adj.*** سەرگەرم؛
زوو هەڵدەچێت؛ تەنگەجیکلانە.
**quick-witted** (kwik′wit′id), ***adj.*** بۆ قسەی نەنتیکە دانامێنێت
**quid** (kwid), ***n.*** پارچەیەك تووتن بۆ جوین.
**quid** (kwid), ***n.*** [British Slang], پاوەنی ئیسترلینی یا ئینگلیزی.
**quiddity** (kwid′ə-ti), ***n.*** (۱) گەوهەری شت؛ ناوەڕۆك؛ نەژاد.
(۲) جیاوازییەکی هیچوپووچ.
**quid-nunc** (kwid′nuŋk′), ***n.*** ووتووات خواز؛ خۆتێهەڵقورتێنەر؛
حەز بە سووسە کەر.
**quid pro quo,** ئەمە بەوە؛ پاك لە پاك؛ کردنی شتێك بۆ کەسێك یا دژ
بەو کەسە بەرامبەر بەو شتەی کردوویەتی.
**quiescence** (kwī-es′'ns), ***n.*** *Also* **quiescency,** خامۆشی؛ کپی؛
بێ دەنگی؛ کش ومانی؛ نەبزووتن؛ وەستان؛ نەجووڵان؛ ماتی؛ هێمنی.
**quiescent** (kwī-es′'nt), ***adj.*** خامۆش؛ کپ؛ کش ومات؛ بێ دەنگ؛

نەبزووت؛ ڕەستاو؛ مات؛ مردوو؛ بێ جووڵە؛ هێمن.
**quiet** (kwī'ət), *adj.* (١) کپ: خامۆش؛ کش‌ومات؛ نەبزووت؛ بە ئارام
(٢) (ا) بێ دەنگ؛ کپ؛ کش‌ومات؛ کڕ. (ب) نەدوو؛ بێ دەنگ؛ کەم دوو.
(٣) مەنگ: هێمن؛ کپ: *( a ~ sea)* .
(٤) هێمن؛ لەسەرخۆ: *( a ~ disposition)*
(٥) سادەو بێ کەش‌و فش: *( a ~ furnishing)*
(٦) سەرکز؛ لە خۆ بایی نەبوو؛ سەلار؛ لەسەرخۆ: *( a ~ manner)* .
(٧) تەریک (٨) ئاسوودەو بێ دەنگ: *( a ~ evening at home)* .
(٩) هێواش؛ بێ جموجووڵ: *( a ~ day at the restaurant)* .
*n.* بێ دەنگی؛ خامۆشی؛ هێمنی؛ کش‌وماتی؛ ئاسوودەیی‌و بێ دەنگی؛ کپی.
*v.t.* بێ دەنگ کردن؛ هێمن کردنەوە؛ هێواش کردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ خامۆش کردن؛ کپ کردن.
*v.i.* **( ~ down ),** بێ دەنگ بوون؛ دامرکانەوە؛ هێمن بوونەوە؛ سرەوتن:
***( The child had been crying but soon ~ed down.)***
***adv.*** بە هێمنی؛ لەسەرخۆ.
**-quietness** *(n.)*.
**quieten** (kwī'ə-t'n), *v.t. & v.i.* [Brit. or Dial.]. هێمن کردنەوە؛ هێمن بوونەوە؛ بێ دەنگ بوون.
**quietism** (kwī'ət-iz'm), *n.* (١) سۆفیێتی؛ ورشکە سۆفیێتی
(٢) ئاسوودەیی
**quietly** (kwī-ət'li), *adv.* بە بێ دەنگ؛ بە بێ خشپە؛ بە هێمنی؛ بە هێواشی؛ بە ئەسپایی
**quietude** (kwī'ə-tōōd', kwī'ə-tūd'), *n.* بێ دەنگی و ئاسوودەیی؛ هێمنی؛ بێ دەنگی؛ ئارام
**quietus** (kwī-ē'təs), *n.* (١) قەرزدانەوە؛ تەواوکردنی ئەرکی سەرشان
(٢) دوایی شت؛ مردن؛ کۆتایی (٣) شتێکی کوشندە.
(٤) دوایی پێهێنەر؛ دامرکێنەرەوە؛ هێمنکەرەوە
**quill** (kwil), *n.* (١) پەڕی باڵندە (بەتایبەتی پەڕە گەورەو بەهێزەکان).
(٢) قەفی پەڕی باڵندە. (٣) پەڕە دڕکاوییەکەی سووچەڕو ژیشک.
(٤) شتی دروستکراو لە قەفی پەڕ (وەک پێنووس‌و پەڕی عوودو گیتار لێدان).
(٥) شمشاڵ (٦) تەشی (٧) توێکڵە داری ووشک کراوە (دەرمانسازی).
*v.t.* (١) لۆچ لۆچ کردنی قوماش. (٢) ڕستن‌و هەڵکردنە سەر تەشی.
**quilling** (kwil'iŋ), *n.* لۆچی دەستکردی قوماش.
**quilt** (kwilt), *n.* لێفە
*v.t.* پێکەوە دوورین وەک لێفە.
*v.i.* لێفە دوورین؛ لێفەکردن
**quilting** (kwil'tiŋ), *n.* (١) لێفە دوورین؛ لێفەکردن
(٢) قوماش‌و ناوئاخنی لێفە.
**quinary** (kwī'nə-ri), *adj.* پێنجە؛ لە پێنج پێکهاتوو.
*n.* پێنج دانە؛ دەستەیەکی پێنج دانەیی
**quince** (kwins), *n.* (١) بەهی (٢) دار بەهی
**quincuncial** (kwin-kun'shəl), *adj.* پێنجی (ووشەی داهاتوو ببینە؛
**quincunx** (kwin'kuŋks), *n.* (١) ڕێکخستنی پێنج شت لەسەر چوارگۆشەیەک یا لاکێشەیەک بە جۆرێک کە چواریان لەسەر گۆشەکان بێ‌و پێنجەمیشیان لە ناوەڕاستدا (٢) ڕێکخرانی پەڕەی گوڵی پێنج پەڕەیی.
**quindecagon** (kwin-dek'ə-gon'), *n.* پانزەگۆشە (ئەندازە)؛ وێنەی پانزەلا
**quindecennial** (kwin'di-sen'i-əl), *adj.* (١) پانزەساڵی؛ هەر پانزە ساڵ جارێک ڕوو دەدات. (٢) پانزە ساڵ دەخایەنێت
*n.* یادی پانزەهەم
**quinquagenarian** (kwiŋ'kwə-ji-nār'i-ən), *adj.* پەنجاساڵە (تەمەن)؛ تەمەنی لەنێوان پەنجاو شەست ساڵدایە
*n.* کەسێکی پەنجاساڵە؛ کەسێکە تەمەنی لە پەنجاکاندا بێت.
**quinque-, quinqu-** (kwiŋ'kwə), پێشگرێکە بەمانای: پێنج؛ پێنجی؛ پێنج‌و چەند جارەی پێنج: *( quinquevalent)* .
**quinquefoliolate** (kwiŋ'kwə-fō'li-ə-lit), *adj.* پێنج گەڵایی.
**quinquennial** (kwiŋ-kwen'i-əl), *adj.* (١) پێنج ساڵ خایەن
(٢) پێنج ساڵی؛ هەر پێنج ساڵ جارێک ڕوو دەدات.
*n.* (١) شتێکی پێنج ساڵ خایەن. (٢) شتێکە هەر پێنج ساڵ جارێک ڕوو بدات
**quinquennium** (kwiŋ-kwen'i-əm), *n.* پێنج ساڵ؛ ماوەی پێنج ساڵ.
**quinquevalent** (kwiŋ'kwə-vā'lənt, kwiŋ-kwev'ə-lənt), *adj.* پێنج هارکێشی.
**-quinquevalence** *(n.)*; **quinquevalency** *(n.)*.
**quinsy** (kwin'zi), *n.* ئالووکەوتن‌و کێم لێهاتنی
**quint** (kwint, kint), *n.* پێڕی پێنج کاغەزی.
**quint** (kwint), *n.* [Colloq.], = **quintuplet.**
**quintain** (kwin'tin), *n.* (١) نیشانی تیر هاویشتن (بریتییە لە نیشانێك کە کراوە بە ستوونێکەوە). (٢) تیر هاویشتن.
**quintal** (kwin't'l), *n.* (١) کنتاڵ؛ قینتار: کێشانەیەکە بریتییە لە سەد پاوەن لە ئەمەریکاو سەدو دوانزە پاوەن لە ئینگلتەرە.
(٢) کێشانەیەکی سەد کیلۆیییە.
**quintan** (kwin'tən), *adj.* پێنج ڕۆژی؛ هەر پێنج ڕۆژ جارێك ڕوودەدات.
*n.* پێنج بەڕۆ؛ تای گەڕاوە؛ تایەکە هەر پێنج ڕۆژ جارێك سەرهەڵدەداتەوە
**quintessence** (kwin-tes''ns), *n.* (١) گەوهەر یا ماددەی پێنجەم: بەگوێرەی فەلسەفەی سەدانی ناوەڕاست پوختەترین ماددەیە (جگە لە ئاو و ئاگرو هەواو خاك) کە ئەستێرەکان‌و ناوکرۆکی هەموو شتی لێ پێکهاتووە
(٢) ناوکرۆك؛ گەوهەر؛ ناوەڕۆك؛ پوختەترین بەشی شتێك.
(٣) نموونە؛ وێنە: *( She is the ~ of virtue and beauty.)*
**-quintessential** *(adj.)*.
**quintet, quintette** (kwin-tet'), *n.* (١) دەستەی پێنجی؛ پێنجی؛ پێنج کەس یا شت. (٢) (ا) پارچەیەك مۆسیقا یا گۆرانی پێنج قۆڵی.
(ب) تیپی مۆسیقا یا گۆرانی پێنج کەسی.
**quintillion** (kwin-til'yən), *n.* (١) ژمارەیەکە بریتییە لە یەك‌و هەژدە سفر لە بەردەمیدا (لە ئەمەریکاو فەرەنسا). (٢) ژمارەیەکە بریتییە لە یەك‌و سی سفر لەبەردەمیدا (لە ئەڵمانیاو ئینگلتەرە).
**quintuple** (kwin'too-p'l, kwin-tū'p'l), *adj.* (١) پێنجی؛ پێنجە؛ پێنج دانەیی؛ پێنج خشتەکی. (٢) پێنج ئەوەندە؛ پێنج قات
*n.* ژمارەیەکی پێنج ئەوەندە.
*v.t. & v.i.* پێنج قات کردن؛ پێنج ئەوەندە لێهاتن؛ لە پێنج دان.
**quintuplet** (kwin'too-plit, kwin-tū'plit, kwin-tup'lit), *n.* (١) (ا) منداڵی پێنجە؛ بەچکەیەکی پێنج هاوزا. (ب) *(pl.)*، پێنجە؛ پێنج هاوزا؛ پێنج هاوسك. (٢) پێنج شتی هاوتوخم؛ پێنجی هاوجۆر.
**quip** (kwip), *n.* (١) قسەی نەستەق؛ قسەی زیرەك؛ قسەی نەنتیکە.
(٢) (ا) توانج؛ گاڵتە؛ قەشمەری. (ب) نوکتە. (٢) **quibble** .
(٣) شتێکی سەیرو نائاسا.
*v.t. & v.i.* قسەی نەستەق کردن؛ توانج گرتن؛ گاڵتەوگەپ کردن.
**quipster** (kwip'stẽr), *n.* قسەی نەستەق کەر؛ توانج گر؛ نوکتەباز؛ گاڵتەچی.
**quipu** (kē'pōō, kwip'ōō), *n.* چەند پەتێکی ڕەنگاوڕەنگ‌و گرێ گرێیە خەڵکی " پیرۆ " جاران ژمێریارییان پێ دەکردو ڕووداویان پێ تۆمار دەکردو نامەیان پێ دەنارد.
**quire** (kwīr), *n., v.t. & v.i.* [Archaic], = **choir.**
**quire** (kwīr), *n.* بەستە کاغەزی بیست‌و چوار یا بیست‌و پێنج پەڕەیی.
**quirk** (kwũrk), *n.* (١) (ا) خواروخێچی؛ لاری.
(ب) خواروخێچی نووسین (بۆ ڕازاندنەوەو خۆشنووسین).
(٢) ئاین‌ونۆین؛ خۆبەدەستەوەنەدان لە گفتوگۆدا.
(٣) نوکتە؛ قسەی نەستەق؛ قسەی خۆش؛ ووتەی نەنتیکە؛ گاڵتەبازی.

(٤) خووی سەیرو تایبەتی کەسێك: *( one of his ~s)* .
(٥) هەوەس یا کردەوەی سەیرو پێشبینی نەکراو.
(٦) درزی بنمیچ (بۆ جوانی).

**-quirkiness** *(n.)*; **quirky** *(adj.)*.

**quirt** (kwũrt), *n.* قامچی ئەسپ سوار.
*v.t.* قامچی لێدان.

**quisling** (kwiz′liŋ), *n.* وولات فرۆش (بەتایبەتی ئەوەی هاوکاری لەگەڵ بێگانەدا بکات بۆ داگیرکردنی وولاتەکەی خۆی)؛ خۆفرۆش؛ جاش.

**quit** (kwit), *v.t.* (١) قەرزدانەوە؛ ئەرك لەسەر شانی خۆ لادان.
(٢) وازهێنان؛ کۆڵ دان؛ لێ گەڕان؛ دەست لێ هەڵگرتن.
(٣) بەرەڵاکردن؛ دەست لێ بەردان.
(٤) بەجێهێشتن؛ لێ کشانەوە؛ دەست لێ هەڵگرتن
(٥) دەست لە کار هەڵگرتن (لە کۆتایی ڕۆژدا یا بە یەکجاری)؛ واز لە ئیش هێنان.
(٦) تەرك کردن (خوو).
(٧) [Archaic]، ڕەووشت نواندن؛ ڕەفتارکردن.
*v.i.* (١) ڕۆیشتن؛ بەجێهێشتن. (٢) وازهێنان؛ کۆڵ دان؛ دەست لێ هەڵگرتن.
(٣) [Colloq.]، واز لە ئیش هێنان بە یەکجاری؛ دەست لە کار هەڵگرتن بە تەواوی.
*adj.* ئازاد؛ بەخشراو؛ بەرەڵا.
**call it quits,** ئاش بەتاڵ لێکردن؛ وازهێنان؛ دەست هەڵگرتن.
**quit it!,** بیبڕەوە!؛ بەسیەتی!؛ ئیتر بەسیەتی!.

**quitclaim** (kwit′klām′), *n.* (١) واز لە مافی خۆ هێنان (بەتایبەتی موڵك)؛ بەشی خۆ دان بە یەکێکی تر. (٢) بەڵگەنامەی وازهێنان لە مافی خۆ بۆ کەسێکی تر لە موڵکێك یا شتێکدا.
*v.t.* وازهێنان لە مافی خۆ بۆ کەسێکی تر لە موڵکێك یا شتێکدا.

**quite** (kwīt), *adv.* (١) بە تەواوی؛ بە یەکجاری: *( It's not ~ finished.)*
(٢) بە ڕاستی؛ بە بێ گومان.
(٣) [Colloq.]، زۆر؛ تا ڕادەیەکی زۆر: *( ~ good)* .
**quite a few,** گەلێك؛ زۆر؛ چەند؛ ژمارەیەکی ئەختێك زۆر.

**quitrent** (kwit′rent′), *n.* *Also* **quit rent,** مزێکە دەدرێ لە باتی ئیش‌وکار (لە ڕژێمی دەرەبەگیدا).

**quits** (kwits), *adj.* پاك لە پاك (قەرزدانەوە، تۆڵە سەندن).
**cry quits,** هاوارکردنی " پاکمان لە پاك "

**quittance** (kwit′'ns), *n.* (١) لە قەرز خۆش بوون؛ گەردن ئازادکردن لە قەرز یا ئەرکی سەرشان؛ بەخشین؛ ئازادکردن.
(٢) بەڵگەنامەی گەردن ئازادکردن لە قەرز یا ئەرکی سەرشان.
(٣) بژاردن؛ هەق بۆ کردنەوە؛ دانەوە.

**quitter** (kwit′ẽr), *n.* [Colloq.], زوو دەست هەڵگر؛ زوو وازهێنەر؛ زوو ڕاکەر لە ئەرکی سەرشان؛ بەرگەنەگر.

**quittor** (kwit′ẽr), *n.* ئەخۆشی سمی ئەسپ و گیاندارە یەك سمەکانی تر

**quiver** (kwiv′ẽr), *v.i.* لەرزین؛ لەرینەوە؛ تەزوو بە گیاندا هاتن؛ مووچڕکە پێداهاتن.
*n.* لەرزین؛ ئەرە؛ لەرینەوە؛ تەزوو؛ مووچڕکە.

**quiver** (kwiv′ẽr), *n.* (١) تیردان؛ کیف یا هەگبەی تیر.
(٢) پڕ تیردانێك تیر.
**have an arrow left in one's quiver,** تەواو پەکی نەکەوتووە؛ هێشتا شتێکی پێ ماوە؛ لە بنی هەمانەکەی نەداوە.

**qui vive?** [Fr.], کێیە ئەوە؟ (تێخوڕینی پاسەوان).
**on the qui vive,** لەسەر پێ؛ وریا؛ ئاگادار.

**quixotic** (kwik-sot′ik), *adj.* (١) دۆن کیشۆتی؛ لەسەر ڕێ و شوێنی دۆن کیشۆت (٢) ئاکردەنی؛ خەیاڵی؛ دوور لە ژیانی ڕاستەقینەوە؛ شێتۆکە؛ دێوانەیی؛ زۆر ڕۆمانتیکی.

**-quixotical** *(adj.)*; **quixotically** *(adv.)*; **quixotism** *(n.)*.

**quiz** (kwiz), *n.* (١) [Rare]، کەسێکی سەیر. (٢) تەشقەڵە؛ پەنگ. (٣) پرسیار. (٤) تاقیکردنەوەیەکی کورت یا بچکۆلە.
*v.t.* (١) پەنگ پێدان؛ تەشقەڵە پێکردن. (٢) پرسیارلێکردن بە ووردی.
(٣) تاقیکردنەوە (بەتایبەتی هی کورت یا بچووك).

**quizzical** (kwiz′i-k'l), *adj.* (١) سەیر؛ پێکەنیناوی؛ ئەنتیکە.
(٢) لاقرتێکەر بە خەڵك؛ گاڵتە بە خەڵك کەر؛ توانج گر؛ گاڵتەچی.
(٣) سەرسام ماو؛ سەرسوڕماو؛ سەر لێ شێواو: *( a ~ smile)* .

**quod** (kwod), *n.* [British Slang], بەندیخانە.

**quod vide** (kwod vī′di), [L.], ببینە (ووتەیەکی پەراوێزییە کورت دەکرێتەوە بۆ **q.v.**).

**quoin** (koin, kwoin), *n.* (١) (ا) گۆشەی دەرەوەی دیوار.
(ب) بەردی ئەم گۆشەیە (٢) بەردی بناغە؛ بەردی بنچینە. (٣) پارچە دارێك یا کانزای مێخیە تیپی چاپەمەنی لە جێی خۆیدا پێ ڕادەگیرێ
*v.t.* (١) ڕاگرتنی تیپی چاپەمەنی لە جێی خۆیدا. (٢) بەردی بناغە دانان.

**quoit** (kwoit, koit), *n.* (١) ئەڵقەی یاری ئەڵقەو مێخ: ئەڵقەیەکی ئاسنە دەهاوێژرێ بۆ ئەوەی لەسەر مێخەکە بنیشێتەوە.
(٢) (*pl.*) یاری ئەڵقەو مێخ.
*v.i.* یاری ئەڵقەو مێخ کردن.

**quorum** (kwôr′əm, kwō′rəm), *n.* (١) کەمترین ژمارەی ئەندامی ئەنجومەنێکە کە دەتوانرێ کۆڕی پێ بگیرێت. (٢) دەستەی هەڵبژاردە؛ کۆڕ.

**quota** (kwō′tə), *n.* بەرکەوت؛ بەشی پێ بڕاو؛ بەش.

**quotation** (kwō-tā′shən), *n.* (١) ووتەی وەرگیراو لە سەرچاوەیەکەوە بۆ نموونە؛ ووتەی یەکسەر. (٢) وەرگرتنی ووتەی کەسێك و خستنەبەرچاوی وەك نموونە. (٣) (ا) نرخ پێ ووتن یا وەرگرتن (بۆرسە، بازرگانی).
(ب) نرخی پێ ووتراو یا وەرگیراو.

**quotation mark,** نیشانەی ووتەی وەرگیراو و بە نموونە هێنراوە (وەك ئەمانە "........" )؛ وێرگوڵی سەروژێر؛ وێرگوڵی هەڵگەڕاوە

**quote** (kwōt), *v.t.* (١) (ا) وەرگرتنی ووتە لە سەرچاوەیەکەوە وەك نموونە؛ لەبەر ووتن: *( The teacher ~ed Shakespeare.)* .
(ب) وەرگرتن لە سەرچاوەیەکەوەو بە بەڵگە یا نموونە هێنانەوە (لە ووتار یا پەڕتووکدا). (٢) خستنەناو وێرگوڵی هەڵگەڕاوەوە.
(٣) بە بەڵگە یا نموونە هێنانەوە: *( Can you ~ me a recent instance?)*
(٤) نرخ پێ ووتن: *( to ~ someone the price of merchandise)* .
*n.* [Colloq.], (١) **quotation** . (٢) **quotation mark** .

**quoth** (kwōth), *v.t.* [Archaic], ووتی: *( ~ he.)* .

**quotha** (kwōth′ɔ), *interj.* [Archaic], ڕاستە! (لە ڕووی لاقرتێ یا سەرسامییەوە).

**quotidian** (kwō-tid′i-ən), *adj.* (١) ڕۆژانە؛ هەموو ڕۆژێك ڕوودەدات. (٢) هیچ‌وپووچ؛ ئاسایی.
*n.* تای ڕۆژانە.

**quotient** (kwō′shənt), *n.* ئەنجامی دابەش کردن (بیرکاری)؛ بەرکەوت.

**Qur'an** (kō-rän′, kō′ran), *n.* = **Koran.**

**qursh** (kũrsh), *n.* قرش

**q.v.**, [L.], = **quod vide.**

# R r

**R, r** (är), ***n.*** (١) تیپی هەژدەهەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە
(٢) دەنگی ئەم تیپە: "ئاڕ".
(٣) (ا) قاڵبی ئەم تیپە (ب) ئەم تیپە بەچاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) نیشانەی هەژدەهەمە لەریزێکدا؛ هەژدەهەم.
***adj.*** (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) هەژدەهەم
**R** (är). ***n.*** (١) شتێکە لەشێوەی تیپی " R " دا.
(٢) ژمارە (٨٠)ی ڕۆمانی.
**rabato** (rə-bā'tō, rə-bä'tō), ***n.*** = **rebato.**
**rabbet** (rab'it), ***n.*** *Also* **rebate,** (١) چاڵی ئێکراوی قەراغی دارو تەختە بۆ پێداکردنی زمانە. (٢) جومگەی پێکهاتوو لە زمانە کردن بە چاڵدا یا ئیرومێ کردنی تەختە.
***v.t.*** چاڵ کردنی تەختەو پێداکردنی زمانە؛ ئیرومێ کردنی تەختە
***v.i.*** پێداکردنی زمانە بە چاڵدا؛ ئیرومێ کرانی تەختە.
**rabbi** (rab'ī), ***n.*** مالووم؛ مەلای جوولەکە
**rabbin** (rab'in), ***n.*** = **rabbi.**
**rabbinate** (rab'in-it), ***n.*** (١) مالوومی؛ پلەوپایەی مالووم.
(٢) مالووم گەل
**rabbinic** (rə-bin'ik), ***n.*** زمانی عیبری بەکارهێنراو لە نووسراوەکانی مالوومەکانی سەدەی ناوەڕاستدا
**rabbinical** (rə-bin'i-k'l), ***adj.*** *Also* **rabbinic,** مالوومی؛ تایبەتی بە مالوومەکانی سەدەی ناوەڕاست و بیروباوەڕو زانیاری و زمانەکەیان.
**rabbit** (rab'it), ***n.*** (١) کەروێشك. (٢) کەوڵە کەروێشك
***v.i.*** ڕاوە کەروێشك کردن.
**rabbit punch,** مستەکۆڵەی بە پشتی ملدا دراو (بۆکسبازی)
**rabbitry** (rab'it-ri), ***n.*** کەروێشك خانە؛ شوێنی پەروەردەکردنی کەروێشکی ماڵی
**rabbit's (or rabbit) foot,** پاشووی کەروێشك کە وەك نوشتە سەیر دەکرێ و گوایە بەختی باش دەهێنێت.
**rabble** (rab''l), ***n.*** قەرەباڵغی؛ کۆمەڵە خەڵکێکی دەنگەدەنگکەرو دابین نەکراو؛ جەماوەری هەراوهوریاکەر.
***v.t.*** هێرش بردنە سەر بە جەماوەر یا بە ڕووتەوڕووتە
**the rabble,** ڕووتەوڕووتە؛ بۆرەپیاوان؛ جەماوەر (لەڕووی سووکییەوە)؛ ڕەش و ڕووت گەل؛ عەلەوجەلە.
**rabble** (rab''l), ***n.*** مقاشی تێکدانی ئاسنی تواوەو خاو لە کوورەدا بۆ کردنی بە ئاسنی نەرم یا بەرگەگر
***v.t*** تێکهەڵدانی ئاسنی تواوەو خاو لە کوورەدا.
**rabblement** (rab''l-mənt), ***n.*** هەراوهوریا؛ پشێوی؛ ئاژاوە.
**rabble rouser,** ڕووتەوڕووتە وورووژێنەر؛ جەماوەر وورووژێنەر (بۆ ئاژاوەنانەوە).
**rabid** (rab'id), ***adj.*** (١) دابین نەکراو؛ هار.
(٢) توندوتیژ؛ بێ ئەندازە؛ لە ڕادەبەدەر: ***( ~ hate.)*** .
(٣) هار: ***( a ~ dog.)*** .
-rabidly (***adv.***); **rabidness** (***n.***).
**rabidity** (rə-bid'ə-ti), ***n.*** هاری (سەگ)؛ توندوتیژی؛ هاری.
**rabies** (rā'bēz, rā'bi-ēz'), ***n.*** هاری؛ نەخۆشی هاری؛ میکرۆبی هاری.
**raccoon** (ra-kōōn'), ***n.*** ڕاکوون: گیاندارێکی ئەمەریکی تیسکنی لمۆز درێژی گۆشتخۆرو شیردەرە بە داردا هەڵدەگەڕێ بەزۆری بە شەو دێتەدەرێ لەپشیلە دەچێت.
**race** (rās), ***n.*** (١) پێشبڕکێ؛ کێ بڕکێ؛ ڕاکردن.
(٢) ***(pl.)*** غارغارێن؛ ڕمبازی.
(٣) ملەملێ؛ بۆڕبۆڕێن: ***( The presidential ~ .)*** .
(٤) بۆ پێشەوە چوون؛ ڕاکەڕاك.
(٥) (ا) تەووژمی ئاو؛ خوڕاو؛ شەپۆل. (ب) ڕەوتی تەووژمە ئاو.
(ج) ئاوبارە؛ جۆگەی دەستکرد.
(٦) هێڵی هاتوچۆی پارچە مەکینە.
***v.i.*** (١) پێشبڕکێ کردن؛ ڕاکردن(بۆ بردنەوە)؛ کێ بڕکێ کردن.
(٢) خێرا ڕۆیشتن یا کردن؛ ڕاکەڕاك کردن؛ پەلەکردن.
(٣) خێرا خولانەوە: ***( the engine is ~ing.)*** .
***v.t.*** (١) پێشبڕکێ لەگەڵ کردن.
(٢) غارغارێن پێ کردن ( بۆ بردنەوە)؛ پێشبڕکێ پێ کردن: ***( to ~ horses, cars ).***
(٣) خێرا خولاندنەوە؛ بەنزین زۆر پێدان: ***( don't ~ the engine.)***
**race** (rās), ***n.*** (١) ڕەگەز؛ نەتەوە. (٢) کۆمەڵی هاوپیشەو هاوخوو.
(٣) توخم؛ ڕەسەن. (٤) تام؛ چەژ.
**racecourse** (rās'kôrs', rās'kōrs'), ***n.*** مەیانی غارغارێن یا ڕمبازی؛ مەیانی پێشبڕکێ.
**racehorse,** ئەسپی غارغارێن؛ ئەسپی ڕمبازی.
**raceme** (rā-sēm', rə-sē'), ***n.*** چەند جۆرە گوڵێکە وەك هێشوو بەسەر لاسکێکەوە ڕیز دەبێ (وەك نێرگزە کێوی).
**racer** (rās'er), ***n.*** (١) پێشبڕکێکەر (ئەسپ، مرۆڤ، ئوتومبیل، فڕۆکە).
(٢) خێرا ڕاکەر؛ تیژ؛ خێرا. (٣) جۆرە مارێکە.
**race riot,** ئاژاوەی نێونەتەوەیی.
**racetrack,** مەیانی غارغارێن یا ڕمبازی؛ مەیانی پێشبڕکێ.
**raceway** (rās'wā'), ***n.*** (١) جۆگەی دەستکردی ئاو گواستنەوە؛ ئاوبارە. (٢) بۆڕی پاراستنی تەلی ئەلەکتریك. (٣) **racetrack**.
**rachis** (rā'kis), ***n.*** (١) بڕبڕەی پشت.
(٢) لاسکی گوڵی هێشوویی (وەك نێرگزی کێوی). (٣) قەفی پەڕ.
**rachitis** (rə-kī'tis), ***n.*** = **rickets.**
**racial** (rā'shəl), ***adj.*** (١) ڕەگەزی؛ نەتەوەیی.
(٢) لە جیاوازی نێو ڕەگەزەکانەوە هاتووە.
-racially (***adv.***).
**racism** (rās'iz'm), ***n.*** ڕەگەزپەرستی؛ بە سووك سەیرکردنی ڕەگەزی تر.
**racist** (rās'ist), ***adj.*** ڕەگەزپەرست.
**rack** (rak), ***n.*** (١) چوارچێوەی شت تیادانان یا لەسەر دانان: (ا) ئاخوڕ. (ب) تەلی کووزە پێ بەستنەوە. (ج) سنگی جل هەڵواسین. (د) ڕەفەی دار یا ئاسن. (هـ) چوارچێوەی بۆمبا تێخراو لە فڕۆکەی بۆمباهاوێژدا.
(٢) شیشی داندار کە لەگەڵ چەرخێکی داندارا بەیەکدا دەچن و لەیەك گیردەبن (مەکینەکاری). (٣) چوارمێخە؛ خەرکەمان.
(٤) ئەشکەنجە؛ ئێش و ئازارێکی زۆر؛ هۆی ئێش و ئازاری پیس؛

گۆڕەوشار. مەجان)

*v.t.* (۱) کردن بە سنگدا (جل، شت‌ومەك)؛
خستنەسەر چوارچێوەیەك یا ڕەفەیەك؛ ڕیزکردن بەسەر چوارچێوەیەکەوە.
(۲) لە چوارمێخە کێشان؛ لە خەرکەمان دان؛ گۆڕەوشار دان (مەجان).
(۳) ئێش‌و ئازاردان؛ داخ‌وسوێ کردن بەدڵەوە؛ چەوساندنەوە.
(٤) زۆر ماندووکردن؛ زۆر هەوڵدان؛ گوشین (مێشك)؛ پەستاوتن:
*( to ~ one's brain to come up with an answer)*
(٥) کرێ خانووی زۆر لێ سەندن؛ کرێ خانوو بەرزکردنەوە.

**on the rack,** لە ئەشکەنجەدایە؛ لە ئێش‌و ئازاردایە؛
لەوپەڕی ناخۆشیدا بوون.

**rack one's brain** ( or **memory** ), ئێجگار زۆر هەوڵدان بۆ
بیرکەوتنەوە

**rack** (rak), *n.* ڕەوت؛ ئەرمەلوقە

*v.i.* ڕەوت کردن؛ ئەرمەلوقە کردن.

**rack** (rak), *n.* فەوتان؛ ئەمان. *( go to ~ and ruin )* .

**rack** (rak), *n.* پەڵە هەوری ئابردوو.

*v.i.* ئابردن ( پەڵە هەور)

**rack** (rak), *v.t.* شەراب لە خڵتە گرتنەوە.

**racket** (rak'it), *n.* (۱) هەراوهوریا؛ جەنجاڵ؛ دەنگەدەنگ؛ هەڵا مەڵا.
(۲) بەزم‌و ڕەزم؛ کەیف‌و ڕابواردن؛ ئاهەنگ‌و خۆشی؛ زەماوەند.
(۳) [ Slang ] (ا) پارە پەیداکردن بە ساختە‌و هەڕەشە‌و چەوتی‌و
قاچاخچێتی (ب) ڕێی چەوت‌و ساختە بۆ پارە پەیداکردن؛ پیلانی ساختە.
(ج) پیشە یا کاسبی پارە زۆر پەیداکەر بەتایبەتی بە چەوتی:
*( The law profession has become a ~ .)*
(د) پیشە؛ کاروکاسبی.

*v.i.* (۱) هەراوهوریا کردن؛ دەنگەدەنگ کردن بە کۆمەڵ.
(۲) خەریکی ئاهەنگ‌و بەزم‌و ڕەزم بوون؛ زەماوەند کردن.

**racket** (rak'it), *n. Also* **racquet,** (۱) ڕەکت؛ ڕەکتی تەنس‌و
پینگ پۆنگ (۲) ( *pl.* ) ڕاکێت: یارییەکە لە تەنس دەچێت بە ڕەکتی دەسك
کورت دەکرێ لەناو ژوورێکدا.

**racketeer** (rak'ə-êr´), *n.* پارە پەیداکەر بە فێڵ‌و تەڵەکە‌و
ساختەچێتی‌و هەڕەشە‌و قاچاخ

*v.i.* پارە پەیداکردن بە فێڵ‌و تەڵەکە‌و ساختە‌و هەڕەشە‌و قاچاخ.

**rackety** (rak'ə-ti), *adj.* (۱) بە دەنگ؛ بە دەنگەدەنگ؛
پڕ لە هەراو هوریا. (۲) حەز لە ئاهەنگ‌و بەزم‌و ڕەزم کەر.

**rack railway,** هێڵی دانداری شەمەندەفەر ( بۆ بەرەو ژوورکە).
( پێشی دەوترێ: " **cog railway** " ).

**rack-rent** (rak'rent´), *n.* کرێ خانووی زۆر گران

*v.t.* کرێ خانووی زۆر لێ سەندن

**-rack-renter** *(n.).*

**raconteur** (rak'on-tûr´), *n.* چیرۆکبێژی لێهاتوو؛
چیرۆك گێڕەرەوە بەخۆشی

**racoon** (ra-kōōn'), *n.* = **raccoon.**

**racquet** (rak'it), *n.* = **racket.**

**racy** (rās'i), *adj.* (۱) تام‌و بۆن خۆش (میوە، شەراب)؛ مزر؛ منخۆش.
(۲) توندوتیژ؛ تیژ؛ برندە.
(۳) بێ پەردە؛ هەڵماڵراو؛ بێ ئابڕوو: *( a ~ novel, story, film, etc.)* .

**radar** (rā'där), *n.* ڕادار.

**radar-scope,** شاشەی ڕادار

**raddle** (rad''l), *v.t.* چنین؛ لەیەك هەڵکێشان؛ لەیەکەوە ئاڵاندن.

**raddle** (rad''l), *n.* گلەسوور؛ ڕەنگی ئاڵ یا سوور.

*v.t.* بۆیەی سوور لێدان؛ سوورکردن.

**raddled** (rad''ld), *adj.* سەر لێ شێواو؛ پەشۆکاو؛ ماندوو؛
پەشێو؛ شکست؛ شێواو: *( He seems ~ these days. )* .

**radial** (rā'di-əl), *adj.* (۱) (ا) تیشکی
(ب) لە یەك شوێندا کۆبووەوە؛ بەرەو ناوچەق هاتوو؛ لەیەك شوێنەوە بڵاوبووەوە.
(۲) نیوەتیرەیی (بیرکاری)؛ وەك نیوەتیرە ڕێکخراو.
(۳) قوڵی (توێکاری)؛ هی ناوچەی قوڵ.
(٤) سیمدار (تایەی ئۆتۆمۆبیل): *( a ~ tire )* .

**radian** (rā'di-ən), *n.* گۆشەی نیوەتیرەیی (بیرکاری).

**radiance** (rā'di-əns), *n. Also* **radiancy,** (۱) درەوشانەوە؛
شەوق؛ ڕووناکی؛ شەوقدانەوە (۲) ووزەی تیشکاوەر (فیزیا).

**radiant** (rā'di-ənt), *adj.* (۱) درەوشاوە؛ بەشەوق؛ شەوقدەرەوە؛
ڕووناك؛ بریقەدار؛ تیشکدەر: *( the ~ morning )* .
(۲) پڕ لەخۆشی؛ پڕ کەیف‌و خۆشی‌و ئاسوودە؛ دەم بە پێکەنین‌و خۆش بێن
*( a ~ smile, personality, etc.)*
(۳) تیشکدەرەوە؛ تیشکاوەر؛ تیشکدەر: *( ~ energy.)* .

**radiant** (rā'di-ənt), *n.* (۱) سەرچاوەی ئەستێرەی کشاو
( ئەستێرەناسی). (۲) سەرچاوەی ڕووناکی.

**radiant energy,** ووزەی تیشکاوەر.

**radiate** (rā'di-āt´), *v.i.* (۱) دانەوە (تیشك، ڕووناکی، گەرمی، خۆشی)؛
بریقانەوە؛ تیشکدانەوە؛ بریسکانەوە.
(۲) لێوەهاتن: *( Heat ~ from a fire )* .
(۳) بڵاوبوونەوە لەناو چەقەوە؛ لێوە بڵاوبوونەوە:
*( Highways ~ from the city .)*

*v.t.* (۱) تیشکدانەوە؛ شەوقدانەوە؛ گەرمی یا تیشك لێ بوونەوە.
(۲) دانەوە (خۆشی، دڵنیایی)؛ لێوەهاتن: *( He ~ confidence.)* .
(۳) بڵاوکردنەوە لەناوچەقەوە
(٤) ڕووناك کردنەوە؛ شەوق دانە سەر.

*adj.* (۱) تیشکاوەر؛ تیشکدەرەوە.
(۲) تەرز یا پەل فڕێدەر لەناو چەقەوە؛ لەناوچەقەوە بڵاوبووەوە:
*( ~ flowers)*
(۳) ئەندام‌و پارچەکانی لەناوچەقەوە بڵاوبوونەتەوە بە ڕێك‌وپێکی
(گیانەوەرناسی).

*n.* گیاندارێکە پەلەکانی لەناوچەقەوە بڵاوبوونەتەوە بە ڕێك‌وپێکی
( وەك ماسییە ئەرمەلیقە).

**radiation** (rā´di-ā'shən), *n.* (۱) دانەوە ( تیشك، گەرمی، خۆشی).
(۲) تیشکدانەوە (فیزیا)؛ تیشکاوەری.
(۳) تیشکی ئەتۆم؛ تیشك؛ ووزەی تیشك؛ ووزەی تیشکاوەر.
(٤) ڕێکخرانی پارچەکانی ئەندامێك یا ئەندامەکانی لەشێك بەجۆرێك کە هەموو
لەناوچەقێکەوە هاتبن‌و لەوێش یەك بگرنەوە ( لەشێوەی تەلی تایەی پاسکیلدا).

**radiator** (rā'di-ā´ter), *n.* (۱) ڕادیەتەر؛ ساردکەرەوەی ئوتومبیل.
(۲) ئامێری ژوور گەرمکەرەوە ( بەهۆی بۆری ئاوی گەرم‌و هەڵمەوە).
(۳) سەرچاوەی تیشکاوەر (فیزیا). (٤) نێریەلی نێرەر.

**radical** (rad'i-k'l), *adj.* (۱) بنچینەیی؛ بنەڕەتی؛ ئەوپەڕی:
*( ~ social changes )*
(۲) شۆڕشگێڕی؛ توندڕەوی ڕامیاری؛ ڕادیکاڵی: *( a ~ movement )* .
(۳) ڕیشەیی ( ڕووەکناسی)؛ بنجی؛ ڕەگی؛ بنەڕەگی.
(٤) ڕەگی (بیرکاری).

**radical** (rad'i-k'l), *n.* (۱) ڕەگ؛ بنج؛ بنچینە؛ ڕیشە؛ ڕەگ‌و ڕیشە.
(۲) (ا) شۆڕشگێڕ؛ چەپڕەو؛ ئەوپەڕگر؛ ڕادیکاڵی
(ب) [R-]: ئەندامی کۆمەڵێکی شۆڕشگێڕ یا چەپڕەو.
(۳) کۆمەڵێك ئەتۆم‌و بەلای کەمەوە یەك ئەلەکترۆن (کیمیا).
(٤) (ا) ڕەگی دووجایی یا سێ جایی (بیرکاری) (ب) **radical sign**.
(٥) ڕەگی ووشە ( زمانەوانی)

**radicalism** (rad'i-k'l-iz'm), *n.* (۱) شۆڕشگێڕێتی؛ ڕادیکاڵێتی؛
توندڕەوی ڕامیاری؛ چەپڕەوی. (۲) بیروباوەڕی شۆڕشگێڕێتی؛
ڕێباز‌و بیروباوەڕی ڕادیکاڵێتی یا چەپڕەوی.

**radically** (rad'i-k'l-i, rad'ik-li), *adv.* (۱) لە بنچینەوە؛
لە ڕەگ‌و ڕیشەوە؛ لە سەرچاوەوە.

*( English is ~ a Germanic language. )*

(٢) بنەرەتی؛ بنچینەیی؛ زۆر؛ تەوتۆیی: ( ~ *to change something* ) .

(٣) بەشێوەیەکی شۆڕشگێرانە یا چەپڕەوانە.

**radical sign,** نیشانەی رەگی دووجایی یا سێ جایی (بیرکاری)

**radicel** (rad'ə-sel´), *n.* رەگۆلکە؛ رەگە بچکۆلە

**radices** (rā'də-sēz´), *n. alternative plural of* radix

**radicle** (rad'i-k'l), *n.* (١) رەگی دەماری خوێن یا هەستە دەمار.

(٢) (ا) ئەو بەشەی رووەکی ساوا کە دەبێتە شارەگ. (ب) رەگۆلکە؛ رەگە چکۆلە.

**radii** (rā'di-ī´), *n. alternative plural of* radius.

**radio** (rā'di-ō´), *n.* (١) بەکارهێنانی شەپۆلی ئەلەکترۆماگنێتیکی بۆ ناردن و وەرگرتنی نامەی بێ تەل. (٢) پەیوەندی کردن بە دەزگای بێ تەل.

(٣) رادیۆ. (٤) دەزگای بێ تەل؛ بێ تەل؛ تەلسز

(٥) (ا) بلاوکردنەوە بە رادیۆ یا بەبێ تەل. (ب) ئیستگەی رادیۆ.

(٦) نامەی بێ تەل

*adj.* بێ تەل؛ تەلسز

**radio-** (rā'di-ō, rā'di-ə), پێشگرێکە بەمانای (ا) تیشک؛ تیشکاوەر (ب) بێ تەل؛ تەلسز. (ج) قۆل (تونێکاری).

(د) بە تیشکی ئەتۆم کراو (پزیشکەدانی؛ (ه) تیشکی ئەتۆمدار

**radioactive** (rā´di-ō-ak'tiv), *adj.* تیشکی ئەتۆمدار؛ تیشکاوەر

**radioactivity** (rā´di-ō-ak-tiv'ə-ti), *n.* تیشکی ئەتۆمداری؛ تیشکاوەری

**radio beacon,** رابەری بێ تەل؛ بۆ رێ پیشاندانی کەشتییەوان و فڕۆکەوان.

**radiobiology** (rā´di-ō-bī-ol'əji), *n.* زانستی لێکۆلینەوەی کارکردنەسەری تیشکی ئەتۆم لەسەر زیندەوەر.

**radiobroadcast** (rā'di-ō-brôd´kast, rā'di-ō-brôd´käst),

*v.t. & n.* بە رادیۆ بلاوکردنەوە؛ بەرنامەی رادیۆ؛ بلاوکراوەی رادیۆ.

-radiobroadcaster *(n.).*

**radiocast** (rā'di-ō-kast, rā'di-ō-käst), *v.t. & n.* = radiobroadcast.

**radiochemistry** (ra´di-o-kem'is-tri), *n.* کیمیای تیشکاوەری

**radio compass,** قیبلەنمای بێ تەل؛ کەشتییەوانی

**radio frequency,** لەرەی رادیۆ

**radiogram** (rā'di-ō-gram´), *n.* (١) نامەی بێ تەل؛ بروسکەی بێ تەل (٢) radiograph

**radiograph** (rā'di-ō-graf´, rā'di-ō-gräf), *n.* وێنەی تیشکی ئێکس

*v.t.* وێنەگرتن بە تیشکی ئێکس.

-radiographic *(adj)*; radiography *(n.).*

**radiolocation** (rā´di-ō-lō-kā'shən), *n.* شوێن دیاری کردن یا دۆزینەوەی فڕۆکەی دوژمن بە رادار.

**radiologist** (rā´di-ol'ə-jist), *n.* شارەزای پزیشکەوانی تیشکاوەری؛ زانای تیشکی ئێکس و بەکارهێنانی لە پزیشکەوانیدا.

**radiology** (rā´di-ol'əji), *n.* رادیۆلۆجی؛ زانیاری تیشک؛ پزیشکەوانی تیشکاوەر. زانستی بەکارهێنانی ووزەی تیشکاوەر لە پزیشکەوانیدا.

-radiological *(adj.)* .

**radiometeorograph** (rā´di-ō-mē'ti-er-ə-graf´, rā´di-ō-mē'ti-er-ə-gräf´), *n.* = radiosonde.

**radiometer** (rā´di-om'ə-ter), *n.* رادیۆمەتر؛ پێوەری خەستی ووزەی تیشکاوەری.

**radiometry** (rā´di-om'ə-tri), *n.* پێوانی خەستی ووزەی تیشکاوەری

-radiometric *(adj. ).*

**radiophone** (rā'di-ō-fōn´), *n.* = radiotelephone.

**radioscope** (rā'di-os´kə-p), *n.* رادیۆسکۆپ: دەزگای تیشکی ئێکس؛ دەزگای تێڕوانین یا پشکنینی لەش بە تیشکی ئێکس.

**radioscopy** (rā´di-os'kə-pi), *n.* رادیۆسکۆپی: پشکنین یا تێڕوانینی لەش بە تیشکی ئێکس.

**radiosonde** (rā'di-ō-sond´), *n.* پشکنیاری بێ تەل: ئامێرێکی بێ تەلە لە بالۆنێکەوە بەردەدرێتەوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئاووهەوا ناردنەوەی بۆ سەرزەمین.

(پێشی دەووترێ: " radiometerograph ").

**radio spectrum,** مەودای لەرەی ئەلەکترۆماگنێتیکی رادیۆو تەلەفزیۆن و رادار؛ مەودای لەرەی شەپۆلی رادیۆ.

**radio station,** ئیستگەی رادیۆ

**radiotelegram** (rā´di-ō-tel'ə-gram´), *n.* = radiogram.

**radiotelegraph** (rā´di-ō-tel'ə-graf´, rā´di-ō-tel'ə-gräf´)

, *n.* ئامێری بروسکە ناردن.

*v.t. & v.i.* نامەی بێ تەل ناردن.

-radiotelegraphic *(adj. ).*

**radiotelegraphy** (rā´di-ō-tə-leg'rə-fi), *n.* نامەی بێ تەل ناردن.

**radiotelephone** (rā´di-ō-tel'ə-fōn´), *n.* تەلەفۆنی بێ تەل؛ تەلەفۆنی تەلسز. (هەروەها " radiophone ").

*v.t. & v.i.* نامە ناردن بە تەلەفۆنی بێ تەل.

-radiotelephonic *(adj)* ; radiotelephony *(n.).*

**radiotelescope** (rā´di-ō-tel'ə-skōp´), *n.* دووربینی بێ تەل؛ تەلیسکۆپی بێ تەل.

**radiotherapy** (rā´di-ō-ther'ə-pi), *n.* چارەکردنی تیشکاوەری؛ چارەکردنی نەخۆشی بە تیشک یا تیشکی ئێکس.

**radio wave,** شەپۆلی ئەلەکترۆماگنێتیکی.

**radish** (rad'ish), *n.* توور.

**radium** (rā'di-əm), *n.* رادیۆم: کانزایەکی سپی تیشکدەرەوەیە.

**radium therapy,** چارەکردنی نەخۆشی بە رادیۆم (بەتایبەتی شێرپەنجە).

**radius** (rā'di-əs), *n.* (١) تەلی پێچکەی پاسکیل؛ شتێك کە لەناوچەقەوە بێتەدەرەوە یا لەناوچەقدا یەك بگرێ. (٢) قۆل ( مەکینەکاری).

(٣) نیوەتیرە (ئەندازە).

(٤) ناوچەیەکی بازنەیی بە چواردەوری نیوەتیرەدا:

*( there was no house within a ~ of five miles. )*

(٥) مەودا: *( within the ~ of my experience .)* .

(٦) (ا) ئێسقانە کورت و ئەستوورەکەی دیوی ناوەوەی باسك لە دیوی پەنجە گەورە. (ب) ئێسقانی باسکی گیانداری چوار پێ.

**radius vector,** دووری تیشکۆیی (بیرکاری، ئەستێرەوانی).

**radix** (rā'diks), *n.* (١) رەگ ( رووەك)؛ ریشە؛ بنج.

(٢) بنچینە (بیرکاری). (٣) رەگی ووشە؛ سەرچاوە ( زمانەوانی).

**radome** (rā'dôm´), *n.* رادۆم: گومەزی پارێزەری ئێریەل ( هەوایی ) رادار ( بەتایبەتی لە هەندێ فڕۆکەدا بەکاردێت ).

**radon** (rā'don ), *n.* رادۆن: گازێکی تیشکاوەرییە لە کانزای " radium " وە پەیدادەبێت ( بۆ چارەکردنی نەخۆشی شێرپەنجە بەکاردەهێنرێت)

**radula** (raj'oo-lə), *n.* ئەندامێکی زمان ئاسایی گیاندارە نەرمەکانە ریزێك ددانی بچووکی پێوەیە بۆ خواردەمەنی لەتکردن.

**raff** (raf), *n.* (١) ژمارەیەکی زۆر؛ کۆمەڵ.

(٢) [Scot. Or British Dial.]، زبڵ؛ پاشەڕۆك؛ شتی بۆگەنی فڕێدراو

(٣) riffraff.

**raffia** (raf'i-ə), *n.* (١) دارخورمای رافیە.

(پێشی دەووترێ: " raffia palm ").

(٢) ریشاڵی گەڵای ئەم دارخورمایە کە سەبەتەو حەسیرو شەپقەی لێ دەچنرێ.

**raffinose** (raf'ə-nōs´), *n.* شەکرێکی نەختێك شیرینە لە چەوەندەرو تۆوی پەموو دەردەهێنرێ.

**raffish** (raf'ish), *adj.* (١) بریقەدارو هەرزانبەها.
(٢) سەرسەری؛ بێ ئابڕو؛ بێ شەرم؛ بەرەڵا؛ خوێڕی؛ بێ ڕەووشت.

**raffle** (raf''l), *n.* هایبەخت؛ پشك؛ پیانقۆ.
*v.t.* ( **~off** ), پشك ڕاکێشان؛ خستنە هایبەختەوە.
*v.i.* بەشداری هایبەخت بوون.

**raft** (raft, räft), *n.* کەڵەك
*v.t.* (١) بە کەڵەك پەڕاندنەوە یا گواستنەوە
(٢) کەڵەك لێ دروستکردن؛ کردن بە کەڵەك.
*v.i.* بە کەڵەك پەڕینەوە یا هاتوچۆکردن.

**raft** (raft, räft), *n.* [ Colloq. ], ژمارەیەکی زۆر؛ زۆر.

**rafter** (raf'ter, räf'ter), *n.* کورگە؛ دەستەك.

**raftsman** (rafts'mən, räfts'mən), *n.* کەڵەکەوان؛ کەڵەکچی.

**rag** (rag), *n.* (١) پەڕۆ؛ پەڕۆو پاتاڵ؛ پاتاڵ.
(٢) تلپەی پەڕۆ کە کاغەزی لێ دروست دەکرێ.
(٣) پارچە؛ کوت؛ پنچك.
(٤) (*pl.*)، شرەوپڕە؛ شرە؛ جلی دڕاو؛ کۆنە.
(٥) (*pl.*)، جل‌وبەرگ (لەڕووی گاڵتەوە).
(٦) [ Slang ]، ڕۆژنامە. (٧) دەماری مزرەمەنی.
*adj.* لە پەڕۆ دروستکراو: ***(a ~ doll)*** .

**rag** (rag), *v.t.* (١) کلك پێوەکردن؛ گاڵتە لەگەڵ کردن؛ سەرخستنەسەر.
(٢) سەرزەنشتکردن (٣) [ British ]، تەشقەلە پێ کردن؛ پەنگ پێ دان.
*n.* [ British ], تەشقەلە؛ پەنگ

**rag** (rag), *n.* (١) تەختەبەردێکە دیوێکی زبرە سەربانی بێ تەختەپۆش دەکرێت (٢) [ British ]، هەر جۆرە بەردێکی زبر.

**rag** (rag), *n.* [ Slang ], *n.* & *v.t.* = **ragtime.**

**ragamuffin** (rag'ə-muf´in), *n.* منداڵێکی پیس‌و پۆخڵی شڕەوپڕە لەبەر؛ کەسێکی پنتی یا شڕپۆش.

**rage** (rāj), *n.* (١) [Obs.] شێتی؛ شێتێتی.
(٢) تووڕەیی‌یەکی ئێجگار زۆر؛ شێتگیری.
(٣) هێزێکی توندوتیژ ( وەك هی با و زریان ).
(٤) حەزی بەتین؛ ئارەزوویەکی بەتین؛ پەرۆشی؛ تاسە.
(٥) باو؛ مۆدە؛ خولیای سەردەمی گشت کەس.
*v.i.* (١) زۆر تووڕەبوون؛ شێتگیربوون.
(٢) هەڵچوون ( دەریا، باوبۆران... هتد)؛ وروژان: ***(The see ~d.)*** .
(٣) بڵاوبوونەوە (نەخۆشی)؛ تەشەنە سەندن.

**ragged** (rag'id), *adj.* (١) دڕاو؛ شڕ؛ شڕو وڕ؛ پەڕپووت: ***(a ~ shirt)***
(٢) پنتی؛ شرەوپڕە لەبەر؛ شڕوشیتاڵ لەبەر.
(٣) زبر؛ ناڕێك؛ گرنج گرنج: ***(a ~ edge)*** .
(٤) بژ؛ دانەهێنراو (قژ): ***( ~ hair )***
(٥) ناتەواو؛ کەم‌وکووڕیدار: ***(a ~ style)***
(٦) گڕ؛ ناساز: ***( a ~ voice )*** .

**-raggedly** ***(adv.)***; **raggedness** ***(n.).***

**ragged edge,** قەراغ (کەندەڵان، هەزار بەهەزار، باری ناخۆش)؛ لەسەر قەراغ: ***(on the ~ of poverty)*** .

**ragger robin,** ڕووەکێکی لاسك درێژە گوڵی سوورو سپی‌و پەمەیی دەگرێت

**raglan** (rag'lən), *n.* جۆرە پاڵتۆ یا چاکەتێکی دەلبە.

**ragman** (rag'man´, rag'mən), *n.* پەڕۆفرۆش

**ragout** (ra-gōō'), *n.* ڕاگوو: شلەی گۆشت‌و سەوزە.

**ragpicker** (rag'pik´er), *n.* کۆنەو شرەوپڕە کۆکەرەوەو فرۆش؛ شرەو کۆنەفرۆش

**ragtag** (rag'tag´), *n.* ڕووتەوپووتە؛ عەلەوجەلە؛ لات‌ولووت. (پێشی دەوروترێ: " **ragtag and bobtail** " لەڕووی سووکی‌یەوە).

**ragmeed** (rag'mēd´), *n.* گیایەکە هەڵاڵەکەی دەبێتەهۆی نەخۆشی هەستیاری.

**ragwort** (rag'wûrt´), *n.* ڕووەکێکی بەرزی گەڵا دانەدانی گوڵ زەردە.

**raid** (rād), *n.* (١) هێرشی ناکاوی لەشکر؛ بەسەردادان؛ هەڵ کوتانە سەر بە لەشکرو فڕۆکەوە؛ پەلاماردانی چەتە بۆ ڕاووڕووت‌و تاڵان کردن.
(٢) هێرشی پۆلیس. (٣) هێرش؛ بەسەردادان.
(٤) هەوڵی پارەبازان بۆ نرخ شکاندنی "بۆرسە" بە لەپڕ فرۆشتنی بەشەکانیان.
*v.t.* هێرش بردنە سەر لەناکاو؛ پەلاماردان؛ بەسەردادان.
*v.i.* بەشداری کردنی هێرش.

**raider** (rād'e), *n.* (١) هێرش بەرە سەر ( بەتایبەتی کەشتی‌و فڕۆکە)؛ هێرشکەر (٢) [R-]، سەربازی شەڕی دەستەویەخە.

**rail** (rāl), *n.* (١) (ا) تەیمان؛ پەرژین؛ شوورە.
(ب) شیشی تەیمان (داریا ئاسن). (٢) نەردە؛ چاغ ( پێ پلیکانە).
(٣) هێڵی شەمەندەفەر.
(٤) شەمەندەفەر: ***(He travels by ~.)*** .
(٥) داری دەرگاو دیوار ( لەسەر لا).
*v.t.* تەیمان کردن؛ پەرژین کردن؛ نەردە بۆ کردن (پێ پلیکانە).

**rail** (rāl), *v.i.* هێرش بردنە سەر بە دەم؛ بە توندوتیژی ڕەخنەلێگرتن؛ سەرزەنشتکردن؛ زۆر گلەیی کردن؛ سکاڵا لەدەست کردن.

**rail** (rāl), *n.* باڵندەیەکی ناو زەلکاوی قاوەیی باڵ کورتە لە قوڵنگ دەچێ.

**rail fence,** تەیمانی شیشە ئاسن یا دار ( کە بەسنگ قایم دەکرێ).

**rail-head** (rāl'hed´), *n.* (١) کۆتایی هێڵی شەمەندەفەر؛ ئەوسەر یا کۆتایی هێڵی شەمەندەفەر. (٢) جێی بار داگرتن لە شەمەندەفەرو ناردنی بۆ لەشکر لە مەیانی جەنگدا

**railing** (rāl'iŋ), *n.* (١) کەرەسەی تەیمان‌و نەردە.
(٢) نەردە (پێ پلیکانە، تەلار)؛ چاغ؛ تەیمان؛ شوورە.

**railroad** (rāl'rōd´), *n.* (١) هێڵی شەمەندەفەر؛ هێڵی ئاسن؛ ڕێگای ئاسن؛ ڕێگای شەمەندەفەر.
(٢) دەزگای ڕێگەی شەمەندەفەرو بەڕێوەبردنی.
*v.t.* (١) شەمەندەفەر گواستنەوە.
(٢) هێڵی شەمەندەفەر بۆ ڕاکێشان؛ ڕێگەی شەمەندفەر بۆ بردن.
(٣) [ Colloq ]، بەپەلە پاڵ پێوەنان‌و مۆرکردن بۆ ئەوەی کاتی ئەوە نەبێ بە ووردی لێی بکۆڵرێتەوە:
***(They ~ed the law through the Congress.).***
(٤) [ Slang ] ، بەخێرایی خستنە بەندیخانەوە ( یا تاوان بۆ هەڵبەستن یا بەپەلە دادپرسین).
*v.i.* لەسەر ڕێی شەمەندەفەر کارکردن.

**railroad flat,** خانوویەکە ژوورەکانی وەك فارگۆنی شەمەندەفەر بە ڕیز دروستکرابن.

**rail-splitter,** دارلەتکەری تەیمان‌و شوورە

**railway** (rāl'wā´), *n.* (١) هێڵی ئاسنی شەقامەکان (بۆ پاسی ناوشار).
(٢) [ British ]، **railroad.**
(٣) هەر هێڵێکی ئاسن بۆ پێچکە بەسەردا خولانەوە.

**raiment** (rā'mənt), *n.* [ Archaic or Poetic ], جل‌وبەرگ؛ پۆشاك.

**rain** (rān), *n.* (١) باران. (٢) باران بارین.
(٣) (ا) کەشی باراناوی. (ب) [*pl.*] وەرزی باران.
(٤) شت بارین یا کەوتنەخوارەوەی کوتوپڕ: ***(a ~ of ashes)*** .
*v.i.* (١) باران بارین؛ بارین: ***(It is ~ing.)*** .
(٢) بارین ( گوللە، بۆمبا... هتد)؛ هاتنەخوارەوە وەك باران؛ وەك باران بارین:
***(Bullets ~ed about him.; Tears ~ed down her cheeks.).***
(٣) باران باراندن ( خودا).
*v.t.* (١) ڕژاندن وەك باران.
(٢) بەسەردا ڕژاندن ( بەخشیش، ستایش)؛ پێ بەخشینی بێ شومار:

. ( *They ~ed praises or gifts on him.* ) بەسەردا باراندن

**rain cats and dogs,** ڕەهێڵەکردن؛ بە لێزمە بارین؛ شەستەکردن؛ بەخوڕ بارین

**rain or shine,** باران بێ یا هەتاو: هەمیشە؛ هەموو کاتێك.

**rain out,** دواخستنی ئاهەنگێك، یارییەك، یا وەرزشێك بەهۆی بارانەوە.

**rainbow** (rān′bō), *n.* پەلکە ڕەنگینە؛ پەلکە زێڕینە.

*adj.* ڕەنگین؛ هەمەڕەنگە؛ ڕەنگاوڕەنگ.

**rainbow trout,** ماسییە ڕەنگینە: ماسییەکی جۆگەو ڕوبارە.

**rain check,** (١) ئەوبلیتەیە کە ئەدرێت بە تەماشاکەرانی یارییەکی دواخراو یا تەواونەکراو بەهۆی بارانەوە تاکو جارێکی تر بتوانن یارییەکە ببینن بە خۆڕایی. (٢) دواخستنی پەسەندکردنی پێشنیازێك یا بانگ کردنێك؛ گفتی دووپاتکردنەوەی بانگ کردنێك یا پێشنیازێك کە ئێستە ناتوانرێ جێبەجێ نکرێت

*( She invited us to dinner but we had to get a ~ because we couldn't go.; Can I get a ~ ?)*

**rain coat** (rān′kōt´), *n.* پالتۆی باران.

**rain drop** (rān′drop´), *n.* دلۆپە باران؛ نمە باران؛ تنۆکە باران.

**rain fall** (rān′fôl´), *n.* (١) باران بارین؛ باران.

(٢) سەرجەمی باران بارینی ناوچەیەك لە ماوەیەکی تایبەتدا (کە بە گرێ " ئینج" دەپێورێت).

**rain forest,** دارستانی باران: دارستانی چڕو هەمیشە سەوزی ناوچە گەرمەکان کە سالی سەد گرێ "ئینچ" بارانی لێ دەبارێ بەلای کەمەوە.

**rain gauge,** *Also* **gage,** باران پێو

**raininess** (rān′i-nis), *n.* باراناوێتی

**rain maker,** باران بارێن ( بە بووکە بارانێ).

**rain making,** (١) باران باراندن (بە بووکە بارانێ).

(٢) باران باراندنی دەستکرد.

**rain proof** (rān′prōōf´), *adj.* بارانبڕ؛ باران دانادات.

*v.t.* بارانبڕکردن.

**rain storm** (rān′stôrm´), *n.* باوبۆران؛ باو باران؛ شەستە باران؛ ڕەهێلە؛ لێزمە.

**rain water,** باراناو.

**rainy** (rān′i), *adj.* باراناوی. ( *~ weather; the ~ season* ).

**rainy day,** ڕۆژی تەنگانە؛ ڕۆژی ڕەش.

**put away ( or provide ) for a rainy day,** پاشەکەوت کردن بۆ ڕۆژی تەنگانە: شت هەلگرتن بۆ ڕۆژی ڕەش.

**raise** (rāz), *v.t.* (١) بەرزکردنەوە؛ بلندکردنەوە

(٢) ڕاستکردنەوە؛ هەلساندنەوە.

(٣) دروستکردن: ( *to ~ a monument* )

(٤) پێ هەلسان: بەرپاکردن؛ گێران (شۆڕش)؛ هاندان:

*( The Indians ~d a revolt. )*

(٥) زیادکردن (پلە، نرخ، هێز)؛ بەرزکردنەوە: ( *He ~d his prices.* ).

(٦) بەرزکردنەوە ( دەنگ، توندوتیژی): ( *She ~d her voice.* ).

(٧) باری ژیان باش کردن یا پلەوپایە بەرزکردنەوە؛ پێشخستن:

*( Hard work ~d the man from poverty.)*

(٨) زیندووکردنەوە؛ گیان هێنانەوە بە بەردا: ( *to ~ from the dead* ).

(٩) بوون بەهۆ: ( *The remark ~d a laugh.* ).

(١٠) هێنانە پێشەوە بۆ باس کردن؛ هێنانەکایەوە:

*( to ~ an issue or a question in a meeting )*

(١١) (ا) کۆکردنەوە (پارە)؛ پیتاك کردن: ( *to ~ money for a cause* ).

(ب) گردکردنەوە؛ پێکەوەنان: ( *to ~ an army* ).

(١٢) لەدەم هاتنەدەرەوە (قیژە، هاوار، وورتە).

(١٣) شکاندن (ئابلووقە)؛ دوایی پێ هێنان؛ لابردن:

*( We have ~d the siege. )*

(١٤) هەلهێنانی هەویر (بە هەویرترش تێکردن).

(١٥) (ا) بەخێوکردن؛ پەروەردەکردن؛ گەورەکردن؛ پێگەیاندن:

*( to ~ children )*

(ب) چاندن؛ پەروەردەکردن؛ بەخێوکردن: ( *They ~ wheat .* )

(١٦) [ Scot.]، تووڕەکردن؛ شێتگیرکردن.

(١٧) هەلکردن ( ئالا، بەیداخ): ( *We ~d our flag.* ).

(١٨) بە ساختە نرخی چەکی پارە زیادکردن.

(١٩) لێ نزیکبوونەوە ( لە کەشتی تر یا لە ووشکانی).

(٢٠) گرەو زیادکردن. (٢١) کۆکێن و بەلغەم هێنانەوە.

*v.i.* (١) [Dial.] ، لە خەو هەلسان.

(٢) [Colloq.]، کۆکێن و بەلغەم هێنانەوە. (٣) گرەو زیادکردن (قومار).

*n.* (١) بەرزکردنەوە؛ بەرزبوونەوە؛ بلندبوونەوە.

(٢) مووچە زیادبوون؛ مووچە بەرزبوونەوە؛ زیادە.

**raise hell ( or Cain, the devil, the roof, etc.),** دنیا هێنانە خوارەوە؛ دنیا دان بەسەریەکدا؛ کردن بە ناخۆشی؛ ئاژاوە نانەوە.

**raised** (rāzd), *adj.* (١) دەرپەڕیو؛ دەرپۆقیو؛ بەرزەك تێخراو؛ لۆچاوی.

(٢) هەلاتوو (هەویر)؛ پفەل؛ پفەل کراو.

**raisin** (rā′z′n), *n.* مێوژ.

**raison d'être** (re′zōn′ de′tr'), [Fr.], هۆی بوون؛ بەلگە یا مەبەستی بوون.

**raj** (räj), *n.* فەرمانڕەوایی؛ دەسەلاتداری.

**rajah; raja** (rä′jə), *n.* ڕاجا: شازادەی هیندی؛ میر یا فەرمانداریکی هیندی.

**rake** (rāk), *n.* چنگال (بۆ گژوگیاو گەلا کۆکردنەوەو زەوی خۆش کردن).

*v.t.* (١) زەوی خۆش کردن؛ تەختکردن: ( *to ~ the soil smooth* ).

(٢) کۆکردنەوە؛ تێکدان و کۆکردنەوە:

*( to ~ the leaves; to ~ out a fire )*

(٣) کۆکردنەوە؛ بۆ گەڕان و کۆکردنەوە؛ پیاگەڕان بە ووردی:

*( to ~ through old magazines for facts )*

(٤) لێ ووردبوونەوە؛ چاو پیاخشاندن.

(٥) تەقەلێکردن بە درێژایی لای کەشتی یا ڕیزە سەرباز.

*v.i.* (١) چنگال بەکارهێنان. (٢) پشکنین؛ گەڕان؛ لێ ووردبوونەوە.

(٣) گسك لێدان؛ پاك کردنەوە؛ تەختکردن ( زەوی)؛ کڕاندن.

**rake up,** کای کۆن بەباکردن؛ زیندووکردنەوەی شتی کۆن؛ خستنەڕووی نهێنی کۆن: ( *to ~ an old charge against someone* ).

**rake** (rāk), *n.* کەسێکی سەرسەری؛ بێ ئابڕوو؛ بێ شەرم؛ بەرەلا؛ خوێڕی.

**rake** (rāk), *v.i.* لێژبوون؛ خواربوون؛ لاربوونەوە (دارئالای کەشتی).

*v.t.* خوارکردنەوە؛ لارکردنەوە.

*n.* (١) لاری؛ خواری؛ خواربوونەوە. (٢) گۆشەی نێوان تیغێك و ئەو ڕووەی دەبڕرێتەوە یا شتەکەی لەسەر دەبڕرێتەوە.

**rake** (rāk), *v.i.* (١) هەلفڕین بەدوای نێچیردا ( هەلۆ).

(٢) شوێن بۆنی نێچیر کەوتن و لووت نان بەزەوییەوە لەباتی بەهەواوە (تانجی).

**rake hell** (rāk′hel´), *n. & adj.* سەرسەری؛ بێ ئابڕوو؛ بێ شەرم؛ بەرەلا؛ خوێڕی.

**rake off** (rāk′ôf´), *n.* [ Slang ], دەلالییەك یا بەشە قازانجێك کە وەك بەرتیل وەرگیرێت.

**raki; rakee** (rə-kē′, rak′i), *n.* عەرەق.

**rakish** (rāk′ish), *adj.* (١) جوان و شۆخ و خێرا (کەشتی)؛ کەشخەو خێرا. (٢) تەڕپۆش و کەیف قنج، کەشخە؛ جل قۆز؛ قۆز.

**rakish** (rāk′ish), *adj.* سەرسەری؛ بێ شەرم؛ بێ ئابڕوو؛ بەرەلا؛ خوێڕی.

-**rakishly** *(adv.)*; **rakishness** *(n.)*.

**rale** (räl), *n.* [ Fr.], خیزەی سنگ؛ خیزەخیز.

**rally** (ral′i), *v.t.* (١) کۆکردنەوەو ڕێکخستن ( لەشکری بەزیو و ڕاکردوو).

(٢) کۆکردنەوە؛ یەك پێگرتن؛ خڕکردنەوە؛ بانگ کردن بۆ یەکگرتن:

*( The leader rallied his people. )*

(٣) زیندووکردنەوە؛ گورج کردنەوە؛ هۆش هێنانەوەبەر:
*( He rallied his energy .)*
*v.i.* (١) کۆبوونەوەو یەکگرتن: *( The soldiers rallied. )* .
(٢) یەکگرتن
(٣) هاتن بە دەنگەوە، دەستی یارمەتی بۆ درێژکردن؛ پشتگرتن:
*( He ~ied to his defeated friend.)*
(٤) هۆش هاتنەوەبەر؛ زیندووبوونەوە
(٥) لێدان و لێدانەوەی تۆپی تەنس چەند جارێك پێش بردنەوەی خاڵێك.
(٦) نرخ بەرزبوونەوە پاش شکانی بۆ ماوەیەك (بۆرسە).
*n.* (١) کۆبوونەوەی جەماوەری:
*( There were several anti-war rallies.)*
(٢) لێدان و لێدانەوەی تۆپی تەنس چەند جارێك پێش بردنەوەی خاڵێك.

**rally** (ral'i), *v.t. & v.i.* گاڵتەپێکردن؛ کلك پێوەکردن؛ قەشمەری پێ کردن؛ پێ پێکەنین.

**ram** (ram), *n.* (١) بەران؛ بەختە بەران؛ بەختە.
(٢) **battering-ram**.
(٣) (ا) نووکی تیژی کەشتی بۆ پیاکێشانی کەشتی دوژمن.
(ب) کەشتی‌یەك کە ئەم نووکە تیژەی هەبێ.
(٤) ترومپا؛ پەمپ
(٥) [ R-] . (ا) کۆنەستێرەی بەران؛ کەلووی بەران. (ب) بورجی بەران.
*v.t.* (١) بە توندی پیاکێشان؛ بە قایم پیامالین؛ قۆچ لێدان؛ شۆق لێدان.
(٢) داکوتان، بەزۆر چەسپاندن؛ بەزۆر تێخستن یا تێکردن.
(٣) بە زۆر کردن یا سەپاندن بەسەرا؛ بە زۆرەملێ بردنەسەرا؛ بە زۆر پێ کردن.
(٤) تێ ئاخنین؛ تێ ترنجاندن؛ تێ پەستن؛ داگرتنەوە؛ پەستنەوە.

**Ramadan** (ram'ə-dän'), *n.* ڕەمەزان؛ مانگی ڕەمەزان؛ مانگی ڕۆژوو گرتن.

**ramble** (ram'b'l), *v.i.* (١) گەڕان، پیاسەکردن؛ گەڕان بەبێ مەبەست.
(٢) بازدان لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر ( لە نووسین یان دوواندا)؛ بە پچڕپچڕ نووسین یا دووان؛ قسەی هەلەق و مەلەق کردن.
(٣) پێچاوپێچ کردن.
(٤) تەرز فڕێدان بە هەموولایەکدا؛ بە هەموولایەکدا بڵاوبوونەوە:
*( The vines ~d over the fence.)*
*n.* پیاسە؛ گەڕانی بێ مەبەست؛ گەڕان.

**rambler** (ram'bler), *n.* (١) گەڕۆك
(٢) بازدەر لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر (لە نووسین و دوواندا).
(٣) گوڵی خۆهەڵواسەر یا تەرزفڕێدەر بە هەموولایەکدا.

**rambling** (ram'bliŋ, ram'b'l-iŋ), *adj.* (١) گەڕۆك.
(٢) بڵاوبووەوە؛ تەرزفڕێداو؛ بڵاوو پێچاوپێچ: *( a ~ house )* .
(٣) دووردرێژو پچڕپچڕ (نووسین، دووان)؛ بازدەر لە باسێکەوە بۆ باسێکی تر.

**Rambouillet** (ram'boo-lā'), *n.* جۆرە مەڕێکی فەرەنسی‌یە بۆ خوری و گۆشت بەخێودەکرێت.

**rambunctious** (ram-buŋk'shəs), *adj.* [ Colloq]. سەرکێش؛ سەرچڵ؛ سەرپێچ، جەربەزە؛ هاروهاج؛ چەتوون؛ لاسار.

**ramekin; ramequin** (ram'ə-kin), *n.* (١) خواردەمەنی‌یەکە لە وردە نان و پەنیرو هێلکە دروست دەکرێت و لە فڕندا دەپێشێنرێت.
(٢) دەفری تیا پیشاندنی ئەم خواردەمەنی‌یە.

**ramification** (ram'ə-fi-kā'shən), *n.* (١) لق و تەرز لێ بوونەوە.
(٢) چڵ؛ لق؛ تەرز
(٣) ئەنجام؛ ئەنجامی ناڕاستەوخۆو دوور : *( the ~ of an act )* .

**ramiform** (ram'ə-fôrm'), *adj.* (١) پەل پەل، لق لێ بووەوە؛ پەلدار. (٢) لە لق دەچێت؛ پەل ئاسا.

**ramify** (ram'ə-fī'), *v.t. & v.i.* لق لێ بوونەوە؛ لق و پۆپ فڕێدان؛ بڵاوبوونەوە؛ تەرز فڕێدان؛ بەش بەش بوون.

**ramose** (rā'mōs, rə-mōs'), *adj.* پەلدار؛ پەل پەل؛ لقدار؛ بڵاو.

**ramous** (rā'məs), *adj.* (١) لە لق یا پەل دەچێت.
(٢) **ramose**.

**ramp** (ramp), *n.* (١) پاڕەوێکی لێژە کە نهۆمەکانی خانوویەك بەیەك دەگەیەنێ. (٢) ڕێگەیەکی کورت و گەلێك جار لێژە کە دوو ڕێگەی بەرزو نزم بەیەکتری دەگەیەنێ. (٣) پێچی ئەردە یا چاغ.
(٤) پاڕەوی سواربوونی فڕۆکەو لێ دابەزینی.

**ramp** (ramp), *v.i.* (١) لەسەر پاشوو ڕاوەستان و دەست بڵاوکردنەوە ( وەك شێری پەیکەرو درووشم).
(٢) هەڵوێستێکی ترسناك و هەڕەشانە وەرگرتن.
(٣) بەلەسەبوون؛ هەڵچوون؛ شێتگیربوون.

**rampage** (ram-pāj'), *n.* بەلەسەیی؛ بەلەسەبوون؛ وورووژان و شت شکاندن و زیان دان: *( The crowd went on a ~ . )*
*v.i.* بەلەسەبوون؛ شێتگیربوون؛ فەرتەنە نانەوە؛ ئاژاوە خستنەوە؛ وورووژان.

**rampageous** (ram-pā'jəs), *adj.* بەلەسە؛ لاسار؛ یاخی؛ شێتگیر.

**rampant** (ram'pənt), *adj.* (١) لە پەرەسەندندایە؛ لە گەشەکردندایە: *( ~ plants )*
(٢) بڵاوبووەتەوە بە هەموولایەکدا؛ دایین نەکراو؛ تەشەنەکردوو:
*( Crime is ~ in the city.)*
(٣) بەلەسە؛ سەرکێش؛ توندوتیژ.
(٤) لایەکی پایەکەی بەرزترە لەلاکەی تر ( خانووسازی)؛ پایەیەکی بەرزترە لەپایەکەی تر (تاق).
(٥) لەسەر پاشوو وەستاوەو دەستەکانی بڵاوکردووەتەوە یەکێکیان لە سەروو ئەوی ترەوە (شێری پەیکەرو درووشم).

**rampart** (ram'pärt), *n.* (١) سەنگەر؛ قەڵا؛ شوورە؛ بەربەست؛ بەست.
(٢) پارێزەر؛ پارێزگار؛ شتی پارێزەر؛ بەربەست:
*( Courage is a ~ against troubles. )*
*v.t.* پاراستن بە سەنگەر یا بە شوورە.

**rampion** (ram'pi-ən), *n.* شێلمە کێویلە.

**ramrod** (ram'rod'), *n.* زمەی تفەنگ؛ سمە.
*adj.* ڕەق؛ توندوتیژ.
*v.t.* بە زۆر کردن؛ پاڵ پێوەنان بۆ پەسەندکردن:
*( to ~ a proposal through a committee )*

**ramshackle** (ram'shak''l), *adj.* شەق و شڕ؛ شلۆق؛ پەڕیووت:
*( a ~ old building )*

**ramson** (ram'z'n, ram's'n), *n.* (١) سیرێکی گەڵا پانە.
(٢) ڕەگی ئەم جۆرە سیرە.

**ramulose** (ram'yoo-lōs'), *adj.* لقی بچکۆلەی زۆر لێ بووەتەوە؛ پەل پەل؛ چڵ چڵ.

**ramus** (rā'məs), *n.* لق؛ پەل (زیندەوەرزانی)؛ چڵ.

**ran** (ran), *past tense of* **run**.
**also ran,** دۆڕاو ( غارغارێن، پێشبڕکێ)؛ نەبراوە.

**rance** (rans), *n.* مەڕمەڕی بەلجیکی ( تەختەکەی سوورەو پەڵەپەڵەی شین و سپی پێوەیە).

**ranch** (ranch), *n.* (١) کێڵگەی ڕەشەووڵاخ و ئاژەڵ و ووڵاخی بەرزە (کە گەلێك جار خاوەنەکەیشی تێدا دەژی)؛ ئاژەڵگەو ماڵی خاوەنەکەی؛ پەروەردگە یا لەوەڕگای ڕەشەووڵاخ و ئەسپ و ئاژەڵ.
(٢) باخ: *( a fruit ~ )* .
(٣) ئەوانەی لە ئاژەڵگە کاردەکەن و دەژین.
*v.i.* لە ئاژەڵگا ئیش کردن؛ ئاژەڵگا بردن بەڕێوە.
*v.t.* لەوەڕاندن؛ کردنە لەوەڕگاوە.

**rancher** (ran'cher), *n.* (١) (ا) خاوەن ئاژەڵگە؛ خاوەن کێڵگەی ڕەشەووڵاخ و ئەسپ و ئاژەڵ. (ب) سەرکاری ئاژەڵگە.
(٢) کاوبۆی؛ گاوان. (هەروەها پێشی دەوترێ: " **ranchman** ").

**ranchero** (ran-chā'rō), *n.* [ Sp.], = **rancher**.

**ranchman** (ranch'mən), *n.* = **rancher**.

**rancho** (ran'chō, rän'chō), *n.* [ Sp.]. (١) کوختەی کرێکاو گاوانی ئاژەڵگە (٢) **ranch**.
**rancid** (ran'sid), *adj.* بۆن درن؛ بونی پیسی ڕۆن و کەرەی کۆن.
-**rancidity** *(n.)*.
**rancor; rancour** (raŋ'ker), کینە؛ کۆنە قین؛ ڕق؛ قین؛ بەدخوازی؛ کۆنە دوژمنایەتی.
**rancorous; rancourous** (raŋ'ker-əs), *adj.* بە قین بە کینە؛ قین هەڵگر؛ کینەدار
-**rancorously** *(adv.)*; **rancorousness** *(n.)*.
**rancour** (raŋ'ker), *n.* [ British spelling ]. = **rancor**.
**rand** (rand), *n.* (١) ناوپۆشی قنگە پاژنەی پێڵاو.
(٢) [Rare or Dial.]، قەراغ؛ پەراوێز؛ کەنار ( وەك کەناری زەوییەك کەحوتە گا یا مەکینە نایگاتێ بیکێڵێت)
(٣) پارەی ئەفەریقای باشوور.
**random** (ran'dəm), *adj.* ڕێکەوت؛ کوێرانە؛ بەبێ بیرلێکردنەوەو پیلان دانان *( a ~ remark, selection, meeting, etc.)*.
**at random,** هەرچۆنێك هەڵسوورا؛ بە کوێرانە؛ چۆن ڕێکەوت وەها *( to shoot at random )*
**randomly** (ran'dəm-li), *adv.* چۆن ڕێکەوت وەها؛ بەبێ پیلان؛ بە ڕێکەوت؛ بە کوێرانە: [ **to read ( or do something ) ~** ]
**randy** (ran'di), *adj.* (١) حەشەری؛ بەئالۆش؛ چاوچڵێس؛ چاوباز (٢) [Scot.] بێ ئەزاکەت؛ بەدڕەوشت.
**ranee** (rä'ni), *n.* = **rani**.
**rang** (raŋ), *past tense of* **ring**.
**range** (rānj), *v.t.* (١) ڕیزکردن
(٢) هاوپۆل کردن؛ پۆل پۆل کردن؛ ڕێکخستن
(٣) خو دانەپاڵ؛ لایەن گرتن
(٤) نیشان گرتن؛ نیشان لێ گرتن؛ ڕیزکردنی نیشان و میلی چەك.
(٥) پێد؛ گەڕان؛ گەڕان: *( They ~d the woods.)*
(٦) لەوەڕاندن؛ کردنە لەوەڕگاوە.
(٧) ئالۆسکاوی لە لەنگەر لابردن و ڕاستکردنەوەی ( بۆ ئەوەی بە ئاسانی شۆڕ بکرێتەوە بۆ لەنگەرخستن)
*v.i.* (١) بەرەو لایەك درێژ بوونەوە:
*( The mountains ~ toward the south.)*
(٢) گەڕان
(٣) بۆ گەڕان ( ڕاو)؛ پێداگەڕان.
*( The dog ~d through the woods. )*
(٤) مەودا ئەوەندە بوون؛ گەیشتنە ئەوەندە (دووری):
*( The gun ~d half a mile.)*.
(٥) لەنێوان ئەوەندەو ئەوەندەدا بوون؛ لەنێوان دوو سنوور یا ڕادەدا بوون:
*( The children ~d in age from two to five years.)*
(٦) نیشتەنی شوێنێك بوون ( ڕووەك و گیاندار)؛ لە ناوچەیەکی تایبەتیدا ڕووان یا ژیان
(٧) دۆزینەوەی ماوە یا دووری نیشان.
*n.* (١) ڕیز؛ زنجیرە (٢) پۆل؛ بابەت؛ جۆر
(٣) زنجیرە شاخ؛ ڕیزە شاخ
(٤) ڕێك؛ ئاست؛ لەسەر یەك هێڵ بوون
*( The tree is on ~ with the house.)*
(٥) (ا) مەودای تفەنگ و دەمانچەو چەکی تر؛ ماوەی بڕکردنی گوللە.
(ب) دووری نیشان.
(٦) مەیانی تفەنگ تەقاندن (بۆ مەشق).
(٧) مەودا؛ ڕادەی گەیشتن؛ ماوەی بڕکردن. *( the ~ of my voice)*.
(٨) گەڕان (٩) لەوەڕگا؛ پاوە
(١٠) جیاوازی (پلە، کەم و زۆری)؛ ئەم پەڕو ئەوپەڕ؛ ڕادەی جیاوازی:
*( The ~ of price was narrow.)*
(١١) ئاگردانی چێشت لێنان بە گاز یا کارەبا؛ دەزگای چێشت پێ لێنان
(١٢) نیشتەنی ( ڕووەك و گیاندار)؛ شوێنی تیا ڕووان و ژیان.
(١٣) مەودا ( ژمێرەکاری).
*adj.* بەرەڵا؛ نەبەستراوە؛ لە لەوەڕگادایەو بەرەڵایە: *( ~ cattle )*.
**range finder,** دووری نیشان دۆزەرەوە ( لە تۆپ و کامێراو شتی تردا)؛ بواردۆز.
**ranger** (rän'jer), *n.* (١) [R-]، (ا) سەربازی هێرش و شەڕی دەستەوییەخە. (ب) قۆڵ؛ پاسەوان؛ حەسحەس.
(٢) (ا) لێپرسراوی باخچەی گشتی ( لە ئینگلتەرە). (ب) **forest ranger**
(٣) گەڕۆك. (٤) ڕەشەووڵاخێکی بەرەڵا لە لەوەڕگادا، واتە: نەبەستراوە.
**rangy** (rān'ji), *adj.* (١) گەڕۆك. (٢) لاق درێژ. (٣) فراوان؛ بلاو؛ گەورە.
**rani; ranee** (rä'ni), *n.* (١) شاژنی هیندی؛ ژنە میر یا فەرماندەری هیندی. (٢) بانووشای هیندی؛ پادشای ژنی هیندی.
**rank** (raŋk), *n.* (١) ڕیز؛ زنجیرە. (٢) ڕێك وپێکی.
(٣) پلە؛ پلەوپایەی کۆمەڵایەتی؛ چینی کۆمەڵ:
*( They come from all ~s of life.)*
(٤) پایەداری؛ پلەوپایەی بەرز؛ بەرزی؛ شکۆ: *( a man of ~ )*.
(٥) پلە ( سوپا، میری، کاربەدەستی): *( the ~ of captain )*
(٦) پلە؛ نمرە؛ پایە: *( a poet of the first ~ )*.
(٧) خانەی ئاسۆیی شەترەنج.
(٨) (ا) ڕیز (سەرباز، ئۆتۆمبیل). (ب) *(pl.)*، لەشکر؛ سوپا.
(ج) *(pl.)*، چینی سەرباز: *( He rose from the ~s.)*.
*v.t.* (١) ڕیزکردن؛ خستنە ڕیزەوە؛ لەڕیزدا دانان.
(٢) پلە بۆ دانان؛ پۆل پۆل کردن یا ڕیزکردن بەپێی پلەوپایە:
*( She ~s him above the rest.)*
(٣) پلە بەرزتربوون لە: *( A colonel ~s a captain.)*.
*v.i.* (١) پلەیەکی تایبەتی هەبوون؛ ئەوەندەهەم بوون لە لیستەیەکدا:
*( He ~s second on the list.)*
(٢) بەرزترین پلە یا کەس بوون:
*( the ~ing member of the committee )*
**pull one's rank on,** [Military Slang], پلەی خۆ بەکارهێنان بۆ سوود وەرگرتن یا بەسەر بەردەستدا خوڕین.
**rank and file,** (١) چینی سەرباز؛ سەربازان.
(٢) ئەندامانی سادەی ڕێکخراوێك یا حیزبێك، نەك سەرکردەکانی
**rise from the ranks,** لە سەربازییەوە بوون بە ئەفسەر وردە وردە.
**rank** (raŋk), *adj.* (١) هەمووشوێنێکی گرتووەتەوە ئەوەندە تەڕزی فرێداوە؛ لە ئەندازە بەدەر بەهێزەو گەورە بووە: *( ~ grass, weed, etc. )*
(٢) زۆر بەپیت؛ زیاد لە پێویست بەپیتە: *( ~ soil )*.
(٣) بۆگەن؛ بۆن دڕن.
(٤) نابەجێ؛ ناشرین؛ پیس و بۆگەن؛ پیس.
(٥) تەواو (لەڕووی ناپەسەندییەوە)؛ ئەوپەڕ:
*( ~ treason, deceit, nonsense, etc.)*
**ranker** (raŋk'er), *n.* [ British], (١) سەرباز.
(٢) ئەفسەرێکە کە لە سەربازییەوە بووبێ بە ئەفسەر.
**ranking** (raŋk'iŋ), *adj.* بەرزترین ئەندامی ئەنجوومەنێك یا دەستەیەکە: *( the ~ing member )*.
**rankle** (raŋ'k'l), *v.i.* (١) هەوکردن؛ ئاوسان؛ دوومەڵ کردن.
(٢) پەنگ خواردنەوەو دڵ ئازاردان؛ هەمیشە پەستکردن یا تووڕەکردن؛ ووروژاندن؛ یادکردنەوەی دەبێتە هۆی ڕق هەڵسان: *( The insult ~d .)*.
**ransack** (ran'sak), *v.t.* (١) پشکنین؛ بەووردی گەڕان یا ووردبوونەوە.
(٢) تالان کردن: *( They ~ed the house, village, etc.)*.
**ransom** (ran'səm), *n.* (١) گەڕاندنەوە یا بەرەڵاکردنی دیلێك یا کەسێکی فڕێنراو بە پارە.
(٢) ئەو پارەیەی دەدرێت (بۆ بەردانی دیلێك یا کەسێکی فڕێنراو).
(٣) گوناە پاك کردنەوە بە قوربانی کردن یا سزا چەشتن.

*v.t.* (١) پارەدان بۆ بەردانی دیلێك یا كەسێكی فڕێنراو.
(٢) (أ) پارە داواكردن بۆ بەردانی دیلێك یا كەسێكی فڕێنراو.
(ب) بەرەڵاكردنی دیلێك یا كەسێكی فڕێنراو پاش پارە وەرگرتن.
(٣) گوناه پاك كردنەوە بە قوربانی كردن.
**rant** (rant), *v.i.* (١) هاوار هاوار كردن؛ قیژەقیژكردن وەك شێت؛
قسەی شێتانە كردن (٢) [British Dial.]، بەزمو ڕەزم گێڕان.
*v.t.* هاوار هاوار كردن؛ قیژەقیژكردن وەك دێوانە.
*n.* (١) قیژەقیژ؛ قیژەو هاوار؛ قسەی شێتانە.
(٢) [British Dial.]. بەزمو ڕەزم گێڕان.
**rap** (rap), *v.t.* (١) پیاكێشان؛ پیاماڵین؛ لێدان؛ تەقە لێ هەڵسان؛
لە دەرگا دان (٢) ( ~ out )، لەپڕو بەپەلە لەدەم دەرپەڕان.
*v.i.* لێدان؛ لە دەرگا دان؛ تەقە لێ هەڵساندن؛ پیادان.
*n.* (١) تەقە؛ تەپە.
(٢) [Slang] لۆمە؛ سەرزەنشتی؛ ڕەخنە: *( to take the ~ )*.
**rap** (rap), *n.* (١) پارەیەكی نێرلەندی قەڵبە
(٢) [Colloq.]. هیچ *( I don't care a ~ .)*
**rap** (rap), *v.t.* (١) [Obs.] فڕاندن؛ لە دەست هەڵپرووسكان؛ گرتن؛
پڕپیاكردن؛ بردن (٢) دڵفڕاندن.
**rap** (rap),[ Slang], *n.* دەمەتەقێ؛ قسەكردن پێكەوە بە ئاشكراو
بێ ترس
*v.i.* پێكەوە دوان بە ئاشكراو بەبێ ترس
*( a place where they could meet and ~ )*
**rapacious** (rə-pā'shəs), *adj.* (١) تاڵانكەر؛ ڕووتكەرەوە
(٢) چاوبرسی؛ برسی؛ بە هیچ تێر نەخۆر؛ چاوچنۆك.
(٣) دڕندە؛ نێچیركوژ؛ گۆشتخۆر؛ ڕاوكەر: *( a ~ animal, bird, etc.)*.
**-rapaciously** *(adv.)*; **rapaciousness** *(n.)*.
**rapacity** (rə-pas'ə-ti), *n.* (١) تاڵانكەری
(٢) چاوبرسێتی؛ چاوچنۆكی؛ برسێتی.
(٣) دڕندەیی؛ ڕاوكردن؛ نێچیر كوشتن
**rape** (rāp), *n.* (١) بە زۆر گاینی كچو ژن؛ ئافرەت زەوتكردن؛ بە زۆر گاین.
(٢) (أ) ڕووتكردنەوە؛ لێ زەوتكردن؛ بەزۆر لێسەندن
(ب) هەڵگرتن؛ فڕاندن (ئافرەت)
(٣) تاڵان كردن؛ تاڵان كردنو وێران كردن.
(٤) شكاندن (یاسا)؛ پەرژین شكان.
*v.t.* (١) بە زۆر گاینی كچو ژن؛ زەوتكردنی ئافرەت.
(٢) هەڵگرتن؛ فڕاندن ( ئافرەت)
*v.i.* بە زۆر گاینی ئافرەت.
**rape** (rāp), *n.* شێلم
**rape** (rāp), *n.* تلپە تری
**rape oil,** ڕۆنی شێلم
**raphe** (rā'fē), *n. Also* **rhaphe,** شوێنی بەیەكگەیشتنی ئەندامێكی
دوو پارچە ( وەك زمان)؛ سیم یا شیرازە ( ڕووەكناسی، گیانەوەرناسی)؛
ناوبەند.
**raphia** (rā'fi'ə), *n.* = **raffia.**
**rapid** (rap'id), *adj.* (١) خێرا؛ گورج؛ پەلە.
(٢) لێژ؛ سەربەرەوخوار؛ سەربەرەوژوور
**-rapidness** *(n.)*.
**rapid fire** (rap'id-fīr'), *adj.* (١) خێر تەقێو *( a ~ gun )*.
(٢) خێرا؛ پەلە؛ خێرا خێرا: *( a ~ talk )*.
**rapidity** (rə-pid'ə-ti), *n.* خێرایی؛ پەلەیی
**rapidly** (rap'id-li), *adv.* خێرا؛ بەخێرایی؛ بە گورجی؛ زوو؛ بەپەلە
**rapier** (rā'pi-er, rāp'yer), *n.* شمشێری دوودەم؛
شیری باریك و نووك تیژ
**rapine** (rap'in), *n.* تاڵان كردن؛ ڕووتكردنەوە؛ ڕاووڕووت؛ تاڵانكاری.
**rapist** (rāp'ist), *n.* بە زۆر گێ؛ ئافرەت بە زۆر گێ.

**rapparee** (rap'ə-rē'), *n.* (١) چەتەی ئێرلەندی.
(٢) چەتە؛ ڕاووڕووتكەر؛ تاڵانكەر.
**rappee** (ra-pē'), *n.* برنووتی توندوتیژ
**rapport** (ra-pôrt', ra-pōrt'), *n.* پەیوەندی نزیك؛ دۆستایەتی؛
نزیكی.
**rapprochement** (ra'prôsh'män'), *n.* ئاشتبوونەوە؛
ڕێككەوتنەوە؛ پێكهاتن؛ پێكهاتنەوە.
**rapscallion** (rap-skal'yən), *n.* قومارباز؛ زۆڵ؛ پیاوخراپ؛
ناڕەسەن؛ ناپیاو؛ ساختەچی.
**rapt** (rapt), *adj.* (١) لەخۆشیدا ئاگا لە خۆ نەماو؛ هۆش لای خۆ نەماو.
(٢) شەیدا؛ گەشكەدار.
(٣) بیروهۆش نەماو؛ بەتەواوی پێوە خەریك بوو: *( ~ in thought )*.
(٤) شەیدایانە؛ گەشكەدارانە. *( a ~ look )*.
**raptorial** (rap-tôr'i-əl, rap-tō'ri-əl), *adj.* (١) بۆ ڕاوكردنو
نێچیر گرتن شیاو: *( ~ claws )*.
(٢) تایبەتی بە باڵندەی ڕاوكەر یا گۆشتخۆر؛ هی چڕنووكدارەكان.
**rapture** (rap'cher), *n.* (١) ئەوپەڕی خۆشی؛ شەیدایی؛ كامەرانی؛
گەشكە. (٢) [Rare]، لە خۆشیدا ئاگا لە خۆ نەمان.
*v.t.* [Poetic], شێتوشەیدا كردن؛ بەختیاركردن؛ گەشكەداركردن.
**rapturous** (rap'cher-əs), *adj.* گەشكەدار؛ شەیدا؛ زۆر دڵخۆش؛
زۆر كامەران.
**rara avis** (rā'rə ā'vis), [L.], (١) كەسێك یا شتێكی بێ هاوتا؛
كەسێكی سەرئاسا. (٢) مەلی دانسقە.
**rare** (râr), *adj.* (١) دەگمەن؛ دانسقە؛ كەم؛ زۆر كەم دەست دەكەوێت؛
بەگران دەست دەكەوێت. (٢) بێ هاوتا؛ نایاب؛ زۆر چاك:
*( a ~ scholar, quality, friendship, etc.)*
(٣) كەم (پاڵەپەستۆی هەوا)؛ تەنك (هەوا): *( ~ air )*.
(٤) [Obs.]، بلاو؛ پەرش و بلاو
**-rareness** *(n.)*.
**rare** (râr), *adj.* نەبرژاو؛ نەكوڵاو؛ باش نەبرژاو یا نەكوڵاو؛ كاڵ وكرچ:
*( ~ meat )*
**rarebit** (râr'bit), *n.* پەنیری تواوە بەسەر نانی برژاوەوە.
**rare-earth elements,** توخمە زەمینییە دانسقەكان (كیمیا).
**raree show,** (١) خۆنوواندنی سەر شەقام.
(٢) peep show.
**rarefaction** (râr'ə-fak'shən), *n.* (١) كەمكردنەوە یا كەم بوونەوەی
پاڵەپەستۆی هەوا (٢) تەنك كردن؛ تەنك بوون
**-rarefactive** *(adj.)*.
**rarefied** (râr'fēd'), *adj.* (١) شاراوە؛ لێڵ؛ كەم كەس تێی دەگات.
(٢) بەرز؛ بەرزو بەشكۆ؛ پاك و خاوێن.
**rarefy** (râr'ə-fī'), *v.t.* (١) كەمكردنەوەی پاڵەپەستۆی هەوا؛
تەنك كردن؛ لە چڕی یا خەستی كەمكردنەوە. (٢) پاك كردنەوە؛ خاوێن كردن؛
پاكژكردن؛ ناسك كردن؛ بەرزكردنەوە.
*v.i.* (١) كەم بوونەوەی پاڵەپەستۆی هەوا؛ تەنك بوون.
(٢) خاوێن بوون؛ پاك و خاوێن بوون
**rarely** (râr'li), *adv.* (١) بە دەگمەن؛ بە هەڵكەوت؛ كەم جار؛ بە دانسقە.
(٢) بەجوانی و نایابی؛ بە لێهاتووانە. (٣) زۆر؛ نێجگار.
**rareripe** (râr'rīp'), *adj.* زۆر پێگەییو.
*n.* میوە یا سەوزەی پێگەییو
**rarity** (râr'ə-ti), *n.* (١) دەگمەنی؛ دانسقەیی؛ زۆر كەمی.
(٢) نایابی؛ زۆر چاكی. (٣) تەنكی؛ شاشی. (٤) شتێكی دانسقەو نایاب.
**rascal** (ras'k'l), *n.* (١) قومارباز؛ ساختەچی؛ زۆڵ؛ ناڕەسەن.
(ئەم ووشەیە گەلێك جار لەڕووی خۆشەویستی و گاڵتەوە بەكاردەهێنرێت)
(٢) [Obs.]، ڕووتە؛ ڕووتەوڕووتەیەك.
*adj.* (١) ناكەس؛ ناپاك؛ پیس؛ ناڕەسەن.

(٢) [Obs.]، هی ڕووتەو پووتە.

-rascaly *(adv.)*.

**rascality** (ras-kal′ə-ti), *n.* (١) قومار، زێڕی، پیاوخراپی، نارەسەنی، ناپیاوی، ڕزیی، بێرەسەندیتی (٢) کارێکی ناپاك و نامەردانە.

**rase** (rāz), *v.t.* = raze.

**rash** (rash), *adj.* (١) هەڵەشە، سەرچڵ، سەرکێش، بێباك، جەربەزە

*( a ~ person )*

(٢) هەڵەشە (کردەوە)، سەرکێشانە *( a ~ act )*.

(٣) [Obs.]، زوو بە ئەنجام گەیێن.

-rashly *(adv.)* ; rashness *(n.)*.

**rash** (rash), *n.* (١) کەرمەزنە، قنچکە، زیپکە، لیر.

*( to break out in a ~ )*

(٢) حەند ڕووداینکی یەك لەدوای یەك، زنجیرە ڕوودان.

*( a ~ of criticism )*

**rasher** (rash′er), *n.* توێژاڵێك یا تیلماسکێك گۆشتی بەرازی سوورەوەکراو.

**rasorial** (rə-sôr′i-əl, rə-sō′ri-əl), *adj.* (١) چینەکەر، (٢) gallinaceous.

**rasp** (rasp, räsp), *v.t.* (١) بە برێەندان کراندن.

(٢) بەدەنگێکی گڕ یا نووساو ووتن.

(٣) بێسەکردن، وەڕس کردن، زیزکردن.

*( The baby's crying ~ed her nerves.)*

*v.i.* (١) کراندن، هەڵ کراندن

(٢) دەنگێکی ناساز یا ناخۆش کردن، کرەکرکردن

*n.* (١) برێەند، برێەنگ (٢) لە برێەندان.

(٣) دەنگێکی گڕو ناساز، دەنگی ناخۆش، کرەکر، دەنگی کراندن.

**raspberry** (raz′ber′i, raz′bər-i), *n.* (١) تووترك (٢) [Slang]، حرت.

**raspy** (ras′pi, räs′pi), *adj.* (١) گڕ، نووساو *( a ~ voice )*.

(٢) ناساز، دەنگ، ناخۆش وەك دەنگی کراندن

(٣) تەنگەحیکڵانە، تەنگەتیلکە، زوو پەست دەبێت.

**rat** (rat), *n.* (١) مشکە کوێرە، جرج

(٢) [Colloq.] توێەنێك قژ یا قوماشە قژی نافرەتی پرتر پێ دەنوێنرێت.

(٣) [Slang] کەسێکی نهێنکری ناپاك بەتایبەتی: (ا) سیخوڕ، جاسووس (بەتایبەتی بەسەر هاوکارەکانی‌یەوە).

(ب) کرێکاری نانار، ناچێتە ناو یەکێتی کرێکارانەوە.

*v.i.* (١) ڕاوە مشکەکوێرە کردن (بەتایبەتی بە سەگەوە).

(٢) [Slang] پشت تێکردنی هاوڕێ و هاوکار لەکاتی تەنگانەدا (وەك چۆن گوایە جرج کەشتی‌یەك بەجێ دەهێڵێت لەپێش نووقم بووندا)؛ ناپاکی کردن، پەیمان شکاندن (ب) سیخوڕی کردن، سووسە کردن (بەتایبەتی بەسەر هاوڕێ و هاوپۆل و هاوکارەوە).

*( to ~ on one's classmates, friends, etc. )*

**Rats!** [Slang], قسەی هۆر، قسەی هیچ و پووچ و بێ مانا.

**smell a rat**, [Slang], هەست بە بیلانی پیس و ناپاك کردن.

**ratable** (rāt′ə-b′l), *adj.* (١) هەڵ دەسەنگێنری، ڕێژەی بۆ دادەنرێ یا لێکدەدرێتەوە (٢) [British]، باجی لەسەرە

**ratafia** (rat′ə-fē′ə), *n. Also* **ratafee.** (١) خواردنەوەیەکی کحوولی‌یە (٢) جۆرێکە لە پسکویت

**ratan** (ra-tan′), *n.* = rattan.

**rataplan** (rat′ə-plan′), *n.* دەنگی تەپڵ لێدان، سمی ئەسپ لەکاتی غارغاریندا، یا تەقەی گوللەپژێن.

*v.i. & v.t.* دەنگێکی وەها لێوەهاتن

**rat-bite fever** ( or disease ), تای جرج، نەخۆشی‌یەکە لە جرج یا مشکەکوێرە گەستنەوە تووش دەبێت.

**ratch** (rach), *n.* = ratchet.

**ratchet** (rach′it), *n.* (١) گیرەو ڕەورەوەی دانداز (٢) گیرە (٣) ڕەورەوەی دانداز، پێچکەی دانداز.

**ratchet wheel,** ڕەورەوەی دانداز

**rate** (rāt), *n.* (١) تێکڕا *( the ~ of speed per hour )*.

(٢) ڕێژە *( the ~ of exchange. )*.

(٣) بەها، نرخ *( postal ~s )*.

(٤) پلە، نمرە *( a first ~ musician )*.

(٥) خێرایی *( He reads at a moderate ~. )*.

(٦) بار، گوێرە

(٧) بابەت، پلەوپایە، جۆر *( a writer of the first ~ )*

(٨) [British]، مولکانە، باجی خانووو زەوی‌وزار.

(٩) [Obs.]، هەند، چەند

*v.t* (١) نرخ لەسەر دانان، هەڵسەنگاندن، خەملاندن.

(٢) پلە یا نمرە بۆ دانان، هەڵسەنگاندن *( How do you ~ his work? )*

(٣) واداتان، دانان.

*( He is ~d as an important national figure.)*

(٤) دیاری کردنی نرخی بار گواستنەوە.

(٥) [Colloq.]، شایستەبوون، هەڵ گرتن، هێنان

*v.i.* (١) پلە یا نمرە بۆ دانران (٢) بەنرخ بوون

**at any rate,** هەرچۆنێك بێت، بەهەر جۆرێك بێت

**at this rate,** (ئەگەر) بەم گوێرەیە بێت، بەپێی ئەمە

**rate** (rāt), *v.t. & v.i.* سەرزەنشتکردن، شکاندن، پیاهەڵشاخان.

**ratel** (rā′təl, rä′təl), *n.* گیاندارێکە لە گورهەڵکەنە دەچێت.

**rate of exchange,** ڕێژە یا بەهای پارە گۆڕینەوە

**ratepayer** (rāt′pā′er), *n.* [British], باجدەر

**-rater** (rāt′er), پاشگرێکە بەمانای نمرە ئەوەندە، پلە ئەوەندە

*( second ~ )*

**rathe** (rāth), *adj.* [Obs. or Poetic], (١) ئامادە، بەپەرۆشەوە، خێرا، زوو (٢) زوو پێگەییو، زوو پشکوتوو.

**rather** (rath′er), *adv.* (١) خێراتر، زووتر

(٢) بەلایەوە باشترە، زیاتر حەزی پێ دەکات.

*( He would ~ go than stay.)*

(٣) وا باشترە، وا بەجێ ترە، لەباتی، نەك.

*( I, ~ than you, should take the risk.)*

(٤) ڕاستتر وایە، نا بەڵکو.

*( It was in the morning, or ~, the early afternoon.)*

(٥) بەپێچەوانەوە، بەڵکو *( We have not lost, ~, we have won. )*

(٦) ئەختێك، تۆزێك، تارادەیەك *( It is ~ cold, stupid, late, etc.)*

(٧) [British Colloq.]، بەڵێ ڕاستە! وایە! بەڵێ! بێ گومان وایە!

**had rather,** بەلاوە باشتربوون، پێ باشتربوون.

*( I had rather die than support that idea.)*

**rathskeller** (räts′kel′er), *n.* چێشتخانەیەکی ژێرزەمینە خواردنەوەی کحوولی تێدا دەست دەکەوێت.

**raticide** (rät′ə-sīd′), *n.* مەرگەمووش، مەرگەمشك، مشك کوژ.

**ratification** (rat′ə-fi-kā′shən), *n.* پەسەندکردن (پەیمان)، مۆرکردن، مۆرکران *( a treaty ~ )*.

**ratify** (rat′ə-fī′), *v.t.* پەسەندکردن (پەیمان)، مۆرکردن.

*( to ~ a treaty )*

-ratifier *(n.)*.

**rating** (rāt′iŋ), *n.* (١) پلە، سەرباز

(٢) لە پلەیەکدا دانان، نمرە یا پلە پێدان، خستنە پۆلێکەوە.

(٣) خەملاندن یا دانانی هێزی مەکینە بەپێی هێزی ئەسپ.

(٤) هەڵسەنگاندنی باری دارایی کەسێك یا بازرگانی‌یەك (بۆ قەرز پێدان)

*( His credit ~ is not good.)*

**rating** (rāt′iŋ), *n.* سەرزەنشتی، شکاندن، پیاهەڵشاخان

**ratio** (rā'shō, rā'shi-ō´), *n.* (١) ڕێژە
*( In our class there is a ~ of three boys to two girls. )*
(٢) ڕێژە (بیرکاری)
**ratiocinate** (rash´i-os'ə-nāt´), *v.i.* لێکدانەوە؛ ژیربێژی.
**-ratiocination** *(n.)*; **ratiocinative** *(adj.)*.
**ration** (rash'ən, râ'shən), *n.* (١) بەش
(٢) بەشی بۆ براوە (خواردەمەنی، ئازووقە... هتد).
(٣) خۆراکی ڕۆژانەی سەرباز
(٤) [Military Slang]، خواردەمەنی؛ خواردن؛ خۆراك.
*v.t.* (١) بەشی خۆ پێدان؛ خۆراکی ڕۆژانە دان بە سەرباز
(٢) بۆ بڕینەوە لەکاتی نەبوونی و جەنگدا (خواردەمەنی، شتومەك)؛ کەم پێدان:
*( to ~ food )*
**rational** (rash'ən-'l), *adj.* (١) مێشکی تایبەتی بەهێزی بیرکردنەوە:
*( ~ powers )*
(٢) بیرکەرەوە؛ ژیر؛ شت لێکدەرەوە:
*( a ~ person; Man is a ~ being.)*
(٣) بەجێ؛ دەچێتە مێشکەوە؛ درووست *( a ~ plan, argument, etc.)* .
**rationale** (rash´ə-nal', rash´ə-nä'li), *n.* (١) بەڵگە؛ بیانوو؛ هۆی بنچینەیی *( the ~ for going to war)* .
(٢) بەڵگە پیشاندان.
**rationalism** (rash'ən-'l-iz'm), *n.* (١) هۆش پەرستی؛ بیرپەرستی؛ مێشك پەرستی. (٢) بیروڕایەکە کە دەڵێت بیرو هۆش سەرچاوەی زانینە نەك خودا
**rationalist** (rash'ən-'l-ist), *n.* هۆش و بیر پەرست؛ مێشك پەرست.
**-rationalistic** *(adj.)*; **rationalistically** *(adv.)*.
**rationality** (rash´ə-nal'ə-ti), *n.* (١) بەجێیی؛ بە مێشکدا چوون؛ ژیرێتی کردەوەیەك یا بیروڕایەك (٢) بیروڕایەك یا کردەوەیەکی بەجێ.
**rationalization** (rash´ən-'l-ī-zā'shən), *n.* (١) بەڵگە بۆ دۆزینەوە؛ بیانوو بۆ دۆزینەوە (٢) بەڵگە؛ بیانوو.
**rationalize** (rash'ən-'l-ī-z´), *v.t.* (١) وەها لێکردن کە بەجێ یا درووست بنوێنێ؛ خستنە قاڵبێکی بەجێ وە.
(٢) بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ بیانوو بۆ دۆزینەوە.
(٣) [Chiefly British]، پێشخستنی پیشەسازی.
*v.i.* (١) بەشێوەیەکی درووست یا بەجێ بیرکردنەوە.
(٢) بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ بیانوو دۆزینەوە بۆ کردارو ڕەفتاری خۆ.
**ratite** (rat'īt), *adj.* تایبەتی بە مەلی ئێسکە کۆڵە تەخت کە ناتوانن بفڕن (وەك ووشترمرخ)
*n.* مەلی ئێسکە کۆڵە تەخت
**ratline** (rat'lin), *n.* (١) پلە پەیژەی کەشتی ( کە لەگوریس یا پەت دروستکراوە). (٢) پەتی ئەم پلە پەیژەیە.
**ratoon** (ra-tōōn'), *n. Also* **rattoon,** خەڵف یا ڕەچی تازەی دارێکی براوە (وەك قامیشە شەکرو مۆز).
*v.i.* خەڵف یا ڕەچی تازە دەرکردن.
**rat race,** [Slang], ڕاکەڕاك؛ هارچاوی و پێشبڕکێی خەڵکی ئەم چەرخە.
**ratsbane** (rats'bān´), *n.* مەرگەمووش؛ ژەهری مشك.
(پێشی دەوروتری "**rat poison**").
**rattan** (ra-tan'), *n. Also* **ratan.** (١) ڕاتان: جۆرە دارخورمایەکی خۆهەڵواسەری قەد باریك و درێژو چیرە. (٢) قەدی ئەم درەختە کە زەمیلەو سەبەتەو گۆچان و شوولکی دارکاری لێ دروست دەکرێ.
(٣) شوولکی دارکاری و گۆچان و داردەستی لەم درەختە دروستکراو.
**ratter** (rat'er), *n.* (١) ڕاوکەری مشکەکوێرە (مرۆڤ، پشیلە، سەگ)؛ مشکەکوێرەگر (٢) [Slang]، کەسێکی ناپاك؛ پەیمان شکێن.
**rattle** (rat''l), *v.i.* (١) شەقەشەق کردن؛ تەقەتەق کردن؛ زرنگەزرنگ هاتن؛ زرنگانەوە؛ هاڕەهاتن
*( a train ~ing along the track.;*
*The window ~s in the wind.)*
(٢) ( ~ on)، چەنەبازی کردن؛ چەنەچەن کردن؛ زۆر ووتن.
*v.t.* (١) شەقەشەق لێ هەڵساندن؛ تەقەتەق پێ کردن؛ زرنگەزرنگ لێ هەڵساندن
*( He ~d the handle. )*
(٢) لەبەرخۆوەو بەپەلە ووتن؛ بەپەلە بە دەم خوێندنەوە؛ لەدەم هەڵودرین:
*( He ~d off a list of names.)*
(٣) [Colloq.]، ووروژاندن؛ پەستکردن؛ دەمارگرتن:
*( The questions ~d the speaker.)*
*n.* (١) شەقەشەق؛ شەقە؛ تەقەتەق؛ تەقە؛ زرنگە؛ زرنگەزرنگ؛ زرنگانەوە؛ هاڕە
(٢) شەقشەقەی منداڵ (٣) قرخە یا دەنگی گیانەلا؛ قرخەقرخ.
(٤) زەنگوڵەی ماری زەنگوڵەدار. (٥) چەنەبازی؛ چەقەچەق؛ چەنەچەن
**rattle brain** (rat''l-brān´), *n.* کەسێکی چەنەبازو بێ مێشك
**rattle brained** (rat''l-brān'd´, *adj.* چەنەباز؛ بێ مێشك؛ نەزیوێژ.
**rattler** (rat'ler), *n.* (١) ئەوەی دەزرنگێتەوە؛ شەقشەقە؛ ڕاوەشێنەر.
(٢) **rattlesnake**. (٣) [Colloq.]، شەمەندەفەری بار.
**rattle snake** (rat''l-snāk´), *n.* ماری زەنگوڵەدار
**rattle trap** (rat''l-trap´), *n.* (١) شتی کۆنەو شەق وشڕو تەقەتەقکەر؛ (بەتایبەتی گالیسکەو ئوتومبیل)؛ ئوتومبیلی کۆن و شەقەشەقکەر.
(٢) [Slang]، (ا) کەسێکی چەنەباز. (ب) دەم.
**rattling** (rat'liŋ), *adj.* (١) شەقەشەقکەر؛ تەقەتەقکەر
(٢) [Colloq.]، گەرم (گفتوگۆ)؛ خێرا: *( ~ conversation )*
(٣) زۆر باش؛ زۆر چاك.
*adv.* [Colloq.], زۆر؛ ئێجگار: *( a ~ good party)* .
**rattly** (rat''l-i, rat'li), *adj.* شەقەشەقکەر؛ تەقەتەقکەر؛ شەق وشڕ.
**rattoon** (ra-tōōn'), *n.* = **ratoon.**
**rat trap** (rat'trap´), *n.* (١) تەڵەی مشکەکوێرە.
(٢) شوێنێکی پیس و پەڕپووت؛ وێرانە. (٣) گیروگرفت؛ تەنگوچەڵەمە
**ratty** (rat'i), *adj.* (١) مشکەکوێرەیی؛ جرجی؛ لە مشکەکوێرە دەچێت.
(٢) پڕ لە مشکەکوێرە.
(٣) [Slang]، پەڕپووت؛ وێرانە؛ ڕووخاو؛ لەکەلاوە دەچێ.
**raucity** (rô'sə-ti), *n.* (١) ناسازی و گڕی دەنگ؛ ناخۆشی دەنگ.
(٢) سەرکێشی؛ بەلەسەیی؛ دابین نەکراوی
**raucous** (rô'kəs), *adj.* (١) گڕو ناخۆش؛ ناساز؛ بەرزو ناساز؛ توندوتیژ: *( ~ voice, laughter, etc.)* .
(٢) چەتوون؛ سەرکێش؛ لاسار؛ بەلەسە؛ بێ ئاسایش: *( ~ frontier town )*
**-raucously** *(adv.)*; **raucousness** *(n.)*.
**ravage** (rav'ij), *n.* (١) وێرانکاری؛ تالانکاری؛ وێران بوون؛ خاپوور.
(٢) *(pl.)*، لەناوچوون؛ لەناوبران؛ زیان؛ ئەنجامی وێرانکاری:
*( the ~s of time, disease, etc.)*
*v.t.* (١) تالان کردن؛ ڕووتکردنەوە.
(٢) وێران کردن؛ خاپوورکردن *( The invaders ~d the town.)* .
*v.i.* (١) وێران کردن؛ خاپوورکردن
(٢) تێکچوون؛ داوەشان: *( a face ~d by disease)* .
**rave** (rāv), *v.i.* (١) وورێنەکردن؛ قسە بزرکاندن؛ وەك شێت قسەکردن؛ قیژاندن: *( ~ing like a madman)* .
(٢) بەجۆشەوە لێ دووان؛ پیاهەڵدان (مرۆڤ، شت):
*( He ~d about her books.)*
(٣) گرمان؛ گرمەهاتن؛ هەنچوون: *( The storm ~d in the forest.)*
*v.t.* وورێنە پێوەکردن؛ وورێنەکردن؛ شێتانە قسەکردن.
*n.* (١) وورێنە؛ قسەی شێتانە. (٢) وورێنەکردن.
(٣) [Slang]، (ا) ستایشی بەجۆش: *( The play got ~s.)* .
(ب) دڵفڕان؛ بۆشێت بوون؛ حەزلێکردن
*adj.* [Colloq.], زۆر بەجۆش (ستایش):
*( The film got ~ reviews.)*
**ravel** (rav''l), *v.t.* (١) ئاڵۆسکاندن؛ ئاڵۆزاندن.

(۲) ڕەوینەوە (قوماش، دەزوو)؛ هەڵوەشاندنەوە؛ شیکردنەوە؛
ڕیشاڵ ڕیشاڵ کردن (۳) ( **out** ~ )، ڕوونکردنەوە؛ ئاسان کردن
*v.i.* (۱) شیبوونەوە؛ هەڵوەشان ( جل، قوماش، تاڵ، دەزوو)؛ ڕەوینەوە؛
داوەشاڵ؛ سووان. (۲) [Rare]، ئاڵۆسکان؛ ئاڵۆزان؛ شێوان
(۳) هەڵ پروان؛ ڕووخان.
***n.*** (۱) ڕەوینەوە (دەزوو، قوماش)؛ هەڵوەشان؛ شیبوونەوە.
(۲) ڕیشاڵ؛ دەزووی هەڵوەشاو یا پچڕاوو فڕێدراو؛ تاڵی لە قوماش هەڵوەشاو.
(۳) ئاڵۆسکاوی؛ شتی ئاڵۆزاو؛ ئاڵۆزاوی؛ گرێ؛ گیروگرفت.
**ravelin** (rav′lin), ***n.*** سەنگەری سێگۆشەیی دەرەوە.
**raveling; ravelling** (rav′'l-iŋ, rav′liŋ), ***n.*** (۱) هەڵوەشان؛
شیکردنەوە؛ شیبوونەوە. (۲) تاڵی هەڵوەشاو لە قوماش؛ تاڵی جیابووەوە.
**ravelment** (rav′'l-mənt), ***n.*** شێواوی؛ ئاڵۆزکاوی؛ ئاڵۆسکان؛
شێوان
**raven** (rāvən), ***n.*** قەلەڕەش؛ قەلەڕەشکە
***adj.*** ڕەش و بریقەدار
**raven** (rav′ən), *v.t.* (۱) ماشینەوە؛ هەڵ لووشین؛ لرف لێدان
(۲) نێچیر گرتن؛ ڕاوکردن؛ تالان کردن؛ بە زۆر گرتن؛ داگیرکردن.
***v.i.*** (۱) ڕاوکردن؛ گەڕن بۆ نێچیر؛ بۆ تالانی گەڕان.
(۲) ماشینەوە؛ هەڵ لووشین؛ لرف لێدان
(۳) زۆر برسی بوون؛ بە هیچ تێر نەخواردن.
***n.* = ravin.**
**ravening** (rav′ən-iŋ), ***adj.*** (۱) نێچیرکوژ؛ ڕاوکەر؛ گۆشتخۆر؛ دڕ؛
بۆ نێچیر گەڕاو (۲) هار؛ شێت؛ شێت و هار.
**ravenous** (rav′ən-əs), ***adj.*** (۱) زۆر برسی؛ زۆرخۆر.
(۲) دڕندە؛ نێچیرکوژ؛ گۆشتخۆر؛ ڕاوکەر
(۳) چاوبرسی؛ چڵێس؛ چاوچنۆک؛ بەهیچ تێرنەخۆر.
(٤) برسی (ستایش، دەسەڵات ... هتد)؛ زۆر حەزکەر؛ بەپەرۆش:
***( ~ for praise, power, etc.)***
**-ravenously** *(adv.)*; **ravenousness** ***(n.)***.
**ravin** (rav′ən), ***n.*** (۱) ڕووتکردنەوە؛ تالان کردن؛ نێچیر گرتن و کوشتن.
(۲) نێچیر؛ تالانی (۳) چاوبرسێتی؛ چڵێسێتی؛ بەهیچ تێر نەخواردن.
***v.t. & v.i.* = raven.**
**ravine** (rə-vēn′), ***n.*** شیو؛ چەم
**raving** (rāv′iŋ), ***adj.*** (۱) شێت؛ وڕوڕێنەکەر؛ دێوانە:
***( a ~ maniac)***
(۲) [Colloq.]، دڵفڕێن؛ شێت وشەیداکەر: ***( a ~ beauty )*** .
***n.*** قسەی بڕبڕکاو یا هەڵەق و مەلەق؛ وڕوڕێنە؛ قسەی بێ مانا.
**ravioli** (rav′i-ō′li.), ***n.*** خواردنێکی ئیتاڵییە بریتییە لە قاوغە
هەویری بچووکی پڕکراو لە گۆشتی قیمەو سپیناغ و دۆشاوی تەماتەو بەهارات.
**ravish** (rav′ish), *v.t.* (۱) (ا) هەڵگرتن؛ فراندن (کچ، ژن، شتومەک)؛
بردن (ب) لەناوبردن؛ لەدەست هەڵپروسکان؛ لێ سەندنەوە
***( ~ed from the world by death)***
(۲) تالان کردن؛ ڕووتکردنەوە
(۳) ئافرەت بەزۆر گاین؛ بەزۆر سواربوون؛ بێ بن کردن.
(٤) دڵفڕاندن؛ شێت وشەیداکردن؛ گەشکەپێدان.
**-ravisher** ***(n.)***.
**ravishing** (rav′ish-iŋ), ***adj.*** دڵفڕێن؛ زۆر جوان؛ خۆش
***( a ~ woman, beauty, view, etc.)***
**ravishment** (rav′ish-mənt), ***n.*** (۱) هەڵگرتن؛ فراندن (کچ، ژن،
شتومەک. (۲) تالانی؛ ڕاوڕووت (۳) ئافرەت بە زۆر گاین؛ بێ بن کردن
(٤) دڵفڕان؛ گەشکە؛ ئەوپەڕی خۆشی
**raw** (rô), ***adj.*** (۱) کاڵ؛ نەکوڵاو ***( ~ meat, vegetables, etc.)*** .
(۲) (ا) خاو؛ نەپاڵێوراو؛ نەبژێرراو؛ پوختە نەکراو ***( ~ material )*** .
(ب) خۆش نەکراو (پێستە، سەوزە پێش کردنی بە ترشیات): ***( ~ hide )*** .
(۳) نەشارەزا؛ نەزان؛ کاڵ و کرچ؛ تازەکوورە.
(٤) گۆشتەوزوون نەهێناوە؛ تازە (برین)؛ پێست لێ داماڵراو (برین)؛
داگیرساو؛ هەوکردوو؛ بە ئازار: ***( a ~ cut, sore, wound, etc.)*** .
(٥) ساردو شێدارو ناخۆش: ***( a ~ wind )*** .
(٦) [Colloq.]، بێ پەردە؛ هەڵماڵراو؛ بەرەڵا؛ بێ شەرم.
(۷) [Slang]، توندوتیژو ناڕەوا:
***( a ~ treatment, punishment, etc.)***
(۸) لەڕوو؛ بێ پێچ و پەنا؛ بێ هیچ شاردنەوە:
***( a ~ portroyal of truth)***
***n.*** برین؛ شوێنی هەوکردوو یا داگیرساو.
**in the raw,** (۱) لەدۆخی سرووشتیدا بەبێ دەستکاری کردن؛
شتەکە خۆی چۆنە هەر وەها: ***( nature in the raw )*** .
(۲) ڕووت؛ ڕووت و قووت.
**raw-boned** (rô′bōnd′), ***adj.*** ڕەقەڵە؛ لەڕ؛ لات.
**raw hide** (rô′hīd′), ***n.*** (۱) پێستەی خۆش نەکراوی ڕەشەوڵاخ و
ئاژەڵ. (۲) قامچی ئەم پێستەیە.
*v.t.* قامچی لێدان؛ دانەبەر قامچی.
**raw material,** کەرەسەی خاو.
**raw silk,** (۱) ئاوریشمی سرووشتی. (۲) قوماشی ئەم ئاوریشمە.
**ray** (rā), ***n.*** (۱) تیشک؛ گزنگ؛ پرشنگ. (۲) وێنەی تیشک.
(۳) ترووسکە؛ تۆزقاڵ؛ ئەخت؛ تۆزێک: ***( a ~ of hope )*** .
(٤) هێڵی لە چەقەوە هاتوو وەک نیوەتیرە (ئەندازە).
(٥) گوڵەئەستێرەیی ( وەک گوڵە چاوپشیلە).
(٦) (ا) ئێسقانی ڕاگیری پەڕەی ماسی. (ب) پەلی ئەستێرەماسی.
*v.i.* پرشنگدانەوە؛ تیشکدانەوە؛ شەوقدانەوە.
*v.t.* (۱) دانەوە (پرشنگ، تیشک، شەوق).
(۲) وێنەگرتن بە تیشکی ئێکس.
**ray** (rā), ***n.*** ڕای: چەند جۆرە ماسییەکی دەریاییی پانکەلەن پەڕەکانیان
پان و گەورەن و کلکێکی باریک و درێژیشیان هەیە لە قامچی دەچێت.
**ray flower,** گوڵەئەستێرەیی ( وەک گوڵە چاوپشیلە).
**rayless** (rā′lis), ***adj.*** تاریک؛ تاریک و ئووتەک؛ ڕووناکی بۆ ناچێت
**rayon** (rā′on), ***n.*** ڕایۆن: (ا) جۆرە ڕیشاڵێکی دەستکردە.
(ب) تەنراوی لەم ڕیشاڵە دروستکراو؛ قوماشی " ڕایۆن".
**raze** (rāz), *v.t.* (۱) ڕووشاندن؛ ئەختێک بریندارکردن.
(۲) تاشین؛ سڕینەوە؛ لێکردنەوە.
(۳) تەختکردن؛ وێران کردن؛ کاول کردن؛ ڕووخاندن بەتەواوی:
***( The occupation army ~d hundreds of villages.)***
**razor** (rā′zer), ***n.*** گوێزان؛ گوێزانی ڕیش تاشین؛ مەکینەی ڕیش تاشین.
**razor back** (rā′zer-bak′), ***n.*** (۱) بەرازە کێوی لای خوارووی
ئەمەریکا (لەشی باریکەو لاقی درێژەو تیرەغەی پشتی تیژە).
(۲) جۆرە ئەهەنگێکە. (۳) گردی لێژو لووتکە تیژ.
**razor billed** (rā′zer-bild′), *Also* **razorbill,** مەلێکی دەریایی
ڕەش و سپی دەنووک تیغییە.
**razz** (raz), ***v.t. & v.i.*** [Slang], گاڵتەپێکردن؛ جڕت بۆ لێدان؛
هووها لێ کێشان.
***n.*** [Slang], جڕت؛ هووها.
**razzle dazzle** (raz′'l-daz′'l), ***n.*** [Slang], بەزم و ڕەزم؛ پشێوی؛
نواندنێکە کە سەگ خاوەنی خۆی تیا ناناسێتەوە.
**re** (rē), ***prep.*** دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ لەبابەت. ( هەروەها " **in re** ").
**re-** (rē), پێشگرێکە بەمانای: (ا) گەڕاندنەوە بۆ دۆخی جاران یا باری
پێشوو؛ دانەوە (repay, restore).
(ب) دووبارە؛ سەرلەنوێ؛ دیسانەوە:
***( reread, reappear, replay, etc.)***
**reach** (rēch), ***v.t.*** (۱) دەست بۆ درێژکردن.
(۲) دەست گەیشتن: ***( Can you ~ the top shelf ? )*** .
(۳) دانە دەست؛ پێدان: ***( ~ me the salt, please.)*** .

(٤) گەیشتن (شوێن) *( We will ~ town by dark.)*

(٥) پێ گەیشتن *( He didn't ~ his goal.)*

(٦) گەیشتنە دەست؛ پێ گەیشتن: *( The news ~ed me late.)*

(٧) کارتێکردن؛ ڕاکێشان؛ دڵ پێ داهێنان.

(٨) پەیوەندی پێوەکردن: *( I couldn't ~ her by phone.)*

(٩) فریاکەوتن *( The help didn't ~ them in time.)*

*v.i.* (١) درێژکردن (دەست، قاچ)؛ ڕاکێشان.

(٢) گەیشتن *( His influence ~s into other lands.)*

(٣) بڕکردن (دەنگ، چاو)؛ گەیشتن. (٤) هەوڵ بۆ دان.

*n.* (١) درێژکردن (دەست، قاچ)؛ ڕاکێشان.

(٢) توانای گەیشتن؛ توانای دەسکەوتن: *( The goal within ~ )*.

(٣) مەودا (دەسەڵات)؛ ئەو دووریەی کە شتێک دەیگاتێ؛ ماوەی بڕکردن:
*( a short ~; a wide ~ )*

(٤) درێژایی ڕووبارێک یا جۆگەیەک لەنێوان دوو پێچدا؛ ڕاستە ڕووبار.

(٥) شوێنی بەربەرەڵاو فراوان؛ دەشت.

(٦) ئەو تەوەرەیە کە ئەکسلی دواوەی ئوتومبیل یا گالیسکە دەبەستێت بە پێشەکەیەوە

**above reach** = out of reach.

**beyond reach** = out of reach.

**out of reach,** (١) دەست نایگاتێ؛ دەستی ناگاتێ

(٢) ناتوانرێ بهێنرێتەدی؛ دوورە دەست؛ دوور؛ پێ گەیشتنی بۆ نییە.

**within reach,** (١) دەست دەیگاتێ؛ دەستی دەگاتێ.

(٢) دەتوانرێ بهێنرێتەدی؛ نزیک؛ نزیکە دەست؛ پێ گەیشتنی بۆ هەیە.

**react** (ri-akt′), *v.i.* (١) بەرپەرچی کار دانەوە

(٢) وەڵام دانەوە بەدەم یا بە کردەوە؛ هەڵوێستی خۆ پیشاندان؛ وەڵام دانەوە:
*( How did she ~ to the proposal?; She ~ed positively.)*

(٣) دژوەستان؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەرامبەر یا بەرەو ڕوو وەستان:
*( to ~ against injustice)*

(٤) گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران یا کۆن.

(٥) کارلێککردن (کیمیا).

**re-act** (rē´akt′), *v.t.* سەرلەنوێ کردنەوە؛ جارێکی تر کردنەوە؛ دیسانەوە نواندن: *( to ~ a scene from the play)*.

**reactance** (ri-ak′təns), *n.* بەرگەگرتنی تەزووی کارەبای بە نۆرە.

**reaction** (ri-ak′shən), *n.* (١) دژەکردار؛ دژکار؛ بەرپەرچی کار

(٢) وەڵام دانەوەی دەمی یا کرداری؛ وەڵام:
*( There has been no ~ from the other side yet.)*

(٣) کۆنەپەرستی؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی کۆن یا جاران.

(٤) گۆڕینی کیمیایی؛ گۆڕانی کیمیایی؛ کارلێککردن.

(٥) وەڵام یا دژکاری لەش بەرامبەر دەرمان یا بزوێنەر (پزیشکەوانی).

**reactionary** (ri-ak′shən-er´i), *adj.* کۆنەپەرست
*( the ~ forces, groups, etc.)*

*n.* کۆنەپەرستێک؛ کەسێکی کۆنەپەرست.

**reactionist** (ri-ak′shən-ist), *n. & adj.* = **reactionary**.

**reactivate** (ri-ak′tivāt), *v.t.* خستنەوە کار؛ خستنەوە گەڕ؛ زیندووکردنەوە (مەجاز).

**-reactivation** *(n.)*.

**reactive** (ri-ak′tiv), *adj.* (١) بەرپەرچدەرەوە؛ دژوەستاو؛ بەرامبەر وەستاو. (٢) وەڵام دەرەوە؛ وەڵام دەر نەک دەستپێشکەریکەر.

(٣) کارلێککەر (کیمیا).

**reactor** (ri-ak′ter), *n.* (١) بەرپەرچدەرەوە؛ بەرامبەر وەستاو؛ دژ وەستاو. (٢) کەسێک کە دەرمان کاری خراپی تێ دەکات.

(٣) ئامێری بەرگرتنی تەزووی کارەبای بە نۆرە.

(٤) **nuclear reactor**

**read** (rēd), *v.t.* (١) خوێندنەوە (٢) بەدەنگی بەرز خوێندنەوە

(٣) بۆ دەرکەوتن؛ تێگەیشتن:
*( You ~ a person's character in his face.)*

(٤) لێکدانەوە (خەو)؛ فاڵ گرتنەوە؛ بەخت بۆ گرتنەوە:
*( to ~ someone's fortune)*

(٥) پێشبینی کردنی دواڕۆژ؛ وا هاتنە بەرچاو:
*( How do you ~ the future of this company.)*

(٦) تێگەیشتن بە جۆرێکی تایبەتی: *( How do you ~ this poem?)*

(٧) نووسران یا لە چاپ دران بەشێوەیەکی تایبەتی:
*( This edition ~s " show," not " shew. ")*

(٨) کۆشش کردن بۆ تاقیکردنەوە: *( to ~ for an exam )*

(٩) پیشاندان: تۆمارکردن و پیشاندان:
*( The thermometer ~s forty degrees.)*

(١٠) خستنە دۆخێکی تایبەتییەوە بە خوێندنەوە ( وەک خەو لە خۆ خستن
*( She ~ s herself to sleep.)*

*v.i.* (١) خوێندنەوە. (٢) بەدەنگی بەرز خوێندنەوە.

(٣) ( ~ about; ~ of ). فێربوون دەربارەی؛ خوێندنەوە دەربارەی.

(٤) کۆشش کردن ( قوتابخانە).

(٥) مانایەکی تایبەتی بەخشین یا دان:
*( The paragraph ~s to the effect that all men are equal.)*

(٦) بەجۆرێکی تایبەتی نووسران یا خوێندنەوە:
*( The sentence ~ s as follows.)*

**read between the lines,** کاغەزی سپی خوێندنەوە؛ مانا و مەبەستی شاراوە بینین یا هەستپێکردن

**read into,** مانای زیادە دانە پاڵ؛ بەجۆرێکی تایبەتی لێکدانەوە یا خوێندنەوە: *( You are reading into the poem too much.)*

**read out of,** دەرکردن (لە حیزب یا ڕێکخراوێک بە خوێندنەوەی ناوی دەرکراوەکە بە دەنگی بەرز بەسەر خەڵکدا).

**read up on,** خوێندنەوە دەربارەی.

**read** (red), *past tense and p.p. of* **read.**

*adj.* زانا؛ تێگەیشتوو یا فێربوو لەڕێی خوێندنەوەوە؛ زۆری خوێندووەتەوە:
*( a well ~ person)*

**readable** (red′ə-b'l), *adj.* (١) دەخوێنرێتەوە؛ وەها نووسراوە کە بخوێنرێتەوە (٢) خوێندنەوەی خۆش و ئاسانە

**-readability** *(n.)*; **readableness** *(n.)*; **readably** *(adv.)*.

**reader** (rēd′er), *n.* (١) خوێنەر؛ خوێندەرەوە؛ خوێندەوار.

(٢) خوێنەری هەڵبەست و چیرۆک بە دەنگی بەرز لە شوێنی گشتیدا.

(٣) خوێنەری نووسراوی ئاینی بە دەنگی بەرز بۆ خەڵک لە کلێسەدا.

(٤) (أ) خوێنەر و هەڵسەنگێنەری دەستنووس پێش چاپ کردنی بە شێوەی پەڕتووک. (ب) خوێندەرەوەی پەڕتووک پاش چاپ کردنی بۆ هەڵەبڕکردن

(٥) فەرمانبەرێکە کە ژمێرەری ئاو و کارەبا و گاز دەخوێنێتەوە.

(٦) یاریدەدەری مامۆستای زانکۆ ( کە تاقیکردنەوە و باسی نووسراوی قوتابییەکان دەخوێنێتەوە لەباتی مامۆستاکە و نمرەیان دەداتێ)

(٧) [Chiefly British]. وانەبێژی زانکۆ و دانشگا

(٨) پەڕتووکی هەڵبژاردەی هۆنراوە و چیرۆک.

(٩) پەڕتووکی خوێندەواری فێرکردن.

**readership** (rēd′ēr-ship´), *n.* (١) سەرجەمی خوێنەری ڕۆژنامە یا گۆڤارێک. (٢) [Chiefly British]. وانەبێژی زانکۆ و دانشگا؛ پلەی وانەبێژی

**readily** (red′'l-i), *adv.* (١) یەکسەر؛ خێرا؛ دەمودەست.

(٢) بەدڵ (٣) بە ئاسانی.

**readiness** (red′i-nis), *n.* ئامادەیی.

**reading** (rēd′iŋ), *adj.* (١) بۆ خوێندنەوە کراوە

(٢) حەز لە خوێندنەوە دەکات.

*n.* (١) خوێندنەوە.

(٢) بە دەنگی بەرز خوێندنەوە بۆ خەڵک لە شوێنی گشتیدا (هۆنراوە، شانۆنامە، چیرۆک): *( She gave a public ~ of her poetry.)*

(٣) کۆشش کردن (قوتابخانە). (٤) شتی ئامادەکراو بۆ خوێندنەوە

(٥) ژمارەی تۆمارکراوی سەر گەرمی پێو یا پەستان پێو.
(٦) شێوەی جیا جیای وشەیەك یا ڕستەیەك لە هۆنراوەیەك یا شانۆنامەیەکی چەند جار لە چاپ دراودا:
*( There were several ~s for the passage.)*
(٧) لیکدانەوەیەکی تایبەتی نووسراوێك:
*( What is your ~ of the poem?).*

**reading room,** ژووری خوێندنەوە ( لە کتێبخانە یا یانەیەکدا).

**readjust** (rē′ə-just′), *v.t.* ڕێکخستنەوە؛ گونجاندنەوە؛ ڕاهێنانەوە؛ ڕاهاتنەوە؛ چاك کردن.

**-readjustment** *(n.).*

**readmission** (rē′əd-mish′ən), *n.* وەرگرتنەوە (لە قوتابخانە یا شوێنێکدا پاش دەرکردن)؛ وەرگێرانەوە.

**readmit** (rē′əd-mit′), *v.t.* وەرگرتنەوە ( لە قوتابخانە یا ڕێکخراوێکدا پاش دەرکردن).

**ready** (red′i), *adj.* (١) ئامادە
*( The house is ~ for occupancy.)*
(٢) سەرز؛ حەز دەکات؛ شل. *( She is ~ . )*.
(٣) ئامادە *( He is always ~ to blame us.)*.
(٤) کارامە؛ زیرەك؛ لێهاتوو
(٥) یەکسەر؛ دەمودەست؛ خێرا: *( a ~ answer)*.
(٦) نزیك بە دەست؛ بە دەستەوەیە؛ بە ئاسانی دەستی لێ گیر دەبێ:
*( ~ cash )*
(٧) [Obs.]، لێرەیە! ( لە وەڵامی ناو خوێندنەوەدا)؛ ئامادەیە!.
*v.t.* ئامادەکردن
*n.* (١) پارەی ڕەق؛ پارەی بە دەستەوە یا نزیك بە دەست.
(٢) ئامادەیی تفەنگ بۆ تەقاندن
**make ready,** (١) ئامادەکردن.
(٢) جل لەبەرکردن؛ خۆ گۆڕین.

**ready-made** (red′i-mād′), *adj.* (١) ئامادە جل‌وبەرگ، پێڵاو)؛ ئامادەستکرد *( ~ suits, shoes, etc.)*
(٢) ئامادە (بیروڕا)؛ کۆن؛ هی کەسەکە خۆی نییە بەڵکو خەڵك لەزوورەوە بیری لێ کردووەتەوە؛ پەڕپووت: *( ~ ideas, opinions, etc.)*.

**ready money,** پارەی ڕەق

**ready-to-wear** (red′i-tə-wâr′), *adj.* جل‌وبەرگی ئامادە، واتە، بە دەست نەدرووراو

**ready-witted** (red′i-wit′id), *adj.* بۆ قسە دانەماو؛ زوو بیرکەرەوە؛ زیرەك؛ وریا.

**reaffirm** (rē′ə-fûrm′),*v.t.* دووپاتکردنەوە؛ تازەکردنەوە.
*( Today, we ~ our friendship.)*

**-reaffirmation** *(n.).*

**reagent** (rē-ā′jənt), *n.* دەرحەری کیمیایی ماددەیەکە کە لەڕێی کارلێککردنی کیمیاییەوە ماددەی تری پێ دەردەخرێ‌و تاقی دەکرێتەوە یا دەگۆڕێت.

**real** (rē′əl, rēl), *adj.* (١) ڕاست
(٢) ڕاستەقینە؛ تەواو: *( ~ gold; a ~ cure; ~ people)*.
(٣) هی خانووبەرە؛ هی زەوی‌وزارو خانوو؛ هی سەرمایەی نەگوێزراوە:
*( ~ property )*
(٤) ڕاستەقینە ( ژمارە، بیرکاری ).
(٥) بوونی ڕاستی‌و بێ گومانی هەیە ( فەلسەفە)
*n.* ( the ~ ), شتی ڕاست؛ شتی ڕاستەقینە
*adv.* [Colloq.], زۆر *( I am ~ sorry.; to have a ~ good time)*.

**real** (rē′əl, re-äl′), *n.* ڕیاڵ پارەیەکی ئیسپانی کۆنە.

**real estate,** خانووبەرە؛ خانوو زەوی‌وزار

**realgar** (ri-al′gər), *n.* ڕیلگار کانزایەکی سووری پرتەقاڵییە بریتییە لە دووەم سولفایدی زەرنیقی فیشەکە شێتەی لێ دروست دەکرێ.

**realism** (rē′əl-iz′m), *n.* (١) ڕاستی پەرستن؛ شوێن خەیاڵ نەکەوتن؛ کردەنی پەرستی. (٢) نواندنی ڕاستەقینەی ژیان‌و سرووشت لە هونەرو وێژەدا ئەگەر چی خۆش‌و ناشیرینیش بێت؛ ڕێبازی ڕاستێتی لە هونەرو وێژەدا. (٣) فەلسەفەیەکە دەڵێت کە شت بوونی ڕاستەقینەی هەیە ئەگەرچی لە ئاگاو هۆشی مرۆڤیشدا نەبێ.

**realist** (rē′əl-ist), *n.* (١) کەسێکی ڕاستی پەرست یا ڕاستی خواز؛ ڕاست بین؛ کەسێکە کە شوێن خەیاڵ نەکەوتبێ‌و خەیاڵ پلاو نەبێ؛ کردەنی خواز. (٢) ڕاستی پەرست لە هونەرو وێژەدا ( وشەی پێشوو ببینە). (٣) پەیڕەویکەری فەلسەفەی ڕاستی ( وشەی پێشوو ببینە)

**realistic** (rē′ə-lis′tik), *adj.* (١) ڕاستی پەرست؛ شوێن خەیاڵ نەکەوتوو:
*( A ~ person is one who knows his limits.)*
(٢) ڕاستەقینە؛ ڕاستی ژیان یا سرووشت پیشاندەر:
*( The film is a ~ picture of life in the country.)*

**-realistically** *(adv.).*

**reality** (ri-al′ə-ti), *n.* (١) ڕاستی.
(٢) کەسێك یا شتێکی ڕاستەقینە.
**in reality,** لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی.

**realization** (rē′əl-ī-zā′shən), *n.* (١) زانین؛ پێزانین؛ بۆ دەرکەوتن.
(٢) هاتنەدی؛ هێنانەدی؛ بە ئەنجام گەیشتن.
(٣) شتی بەدی هێنراو یا بەئەنجام گەیشتوو.

**realize** (rē′ə-līz′), *v.t.* (١) هێنانەدی؛ بە ئەنجام گەیاندن؛ بەجێ هێنان:
*( to ~ one's dreams )*
(٢) زانین؛ ئاگا لێ بوون؛ پێزانین؛ بۆ دەرکەوتن: *( I ~ the difficulties.)*
(٣) گۆڕینەوە یا فرۆشتنی خانوو زەوی‌وزارو بانقەنۆت‌و سامانی تر بە پارەی ڕەق.
(٤) دەسکەوتن؛ هاتنەدەست: *( The company ~d a profit.)*
(٥) ئەوەندە قازانج کردن یا بۆ مانەوە ( لە فرۆشتنی خانووبەرەیەکدا).
*v.i.* گۆڕینەوە یا فرۆشتنی خانووبەرەو بانقەنۆت بە پارەی ڕەق.

**really** (rē′əli, rēl′i), *adv.* (١) لە ڕاستیدا. (٢) بێ گومان.
(٣) بە ڕاستی؛ تەواو؛ زۆر: *( a ~ hot day)*.

**realm** (relm), *n.* (١) پاشانشین؛ وڵات.
(٢) جیهان؛ مەودا:
*( the ~ of imagination, science, thought, etc. )*
(٣) بابەت یا توخمە ڕووەك‌و گیانداری تایبەتی بە ناوچەیەك.

**real member,** ژمارەی ڕاستەقینە ( بیرکاری).

**realtor** (rē′əl-tər, rē′əl-tôr′), *n.* دەلاڵی خانووبەرە؛ جامبازی خانوو زەوی‌وزار کڕین‌و فرۆشتن.

**realty** (rē′əl-ti), *n.* (١) real estate.
(٢) [Obs.]، پاکی؛ دڵسۆزی.

**ream** (rēm), *n.* (١) بەستە کاغەز؛ بەندە کاغەز (٤٨٠-٥١٦ پەرە).
(٢) (*pl.*)، بڕێکی زۆر؛ هەندێکی زۆر؛ ئێجگار زۆر: *( ~s of verse )*.

**ream** (rēm), *v.t.* (١) کون گەورەکردن. (٢) لابردنی شت بە کون تێکردن.
(٣) گوشینی پرتەقاڵ‌و لیمۆ بە گوشەر.

**reamer** (rēm′ər), *n.* (١) کونکەر؛ ئامێری کون تێکردن؛ دەمی دڕەوشی کارەبایی. (٢) گوشەری پرتەقاڵ‌و لیمۆ.
(٣) کونکەر ( مرۆڤ)؛ گوشەر (مرۆڤ).

**reanimate** (rē-an′ə-māt′), *v.t.* زیندووکردنەوە؛ بووژاندنەوە؛ بەهێزکردن.

**-reanimation** *(n.).*

**reap** (rēp), *v.t.* (١) دوورینەوە؛ دروێنەکردن؛ ڕنین؛ خەرمان هەڵگرتن.
(٢) چنینەوە؛ دەسکەوتن؛ وەرگرتن ( خەڵات): *( You ~ what you sow.)*.
*v.i.* (١) دوورینەوە؛ دروێنەکردن؛ ڕنین.
(٢) چنینەوە؛ دەسکەوتن؛ خەڵات وەرگرتن.

**reaper** (rēp′ər), *n.* (١) درەوکەر؛ سەپان؛ دروێنەکەر؛ گۆخل.

(٢) مەكینەی درەو؛ مەكینەی دروێنە.

**the ( Great ) Reaper,** مردن

**reaping hook,** داس.

**reaping machine,** مەكینەی دروێنە؛ مەكینەی درەو

**reapportion** (rē´ə-pôr′shən); *v.t.* سەرلەنوێ بەش كردن؛ سەرلەنوێ دابەش كردن.

**reapporationment** (rē´ə-pôr′shən-mənt), *n.* (١) سەرلەنوێ دابەش كردن؛ سەرلەنوێ بەش كران. (٢) سەرلەنوێ دابەش كردنی ژمارەی نوێنەرانی پەرلەمان بەسەر ناوچەكانی وولآت یا ناوچەیەكدا بە گوێرەی زیادو كەمی دانیشتوان بەتایبەتی دوای هەموو سەرژمێرییەك لە ئەمەریكا.

**rear** (rêr), *n.* (١) پشتەوە؛ پشت؛ دوا؛ دواوە:
***( the ~ of a house )***
(٢) پاشەنگ (لەشكر، مێگەل، كاگەل)؛ پاشڕەو؛ قنگ ( مەجاز).
(٣) [Colloq.]. سمت؛ قنگ، كەفەل.
***adj.*** هی دواوە؛ دواوە: ***( a ~ view; a ~ entrance )***.

**rear** (rêr), *v.t.* (١) بەرزكردنەوە؛ راستكردنەوە؛ ڕاوەستاندن؛ لەسەر پێ ڕاگرتن. (٢) درووستكردن.
(٣) پەروەردەكردن ( گیاندار، ڕووەك)؛ زاوزێ پێ كردن؛ بەخێوكردن.
(٤) بەخێوكردن (منداڵ)؛ گەورەكردن؛ پەروەردەكردن: ***(to ~ children)***.
***v.i.*** (١) لەسەر پاشوو وەستان؛ هەڵسانە سەر پاشوو.
(٢) بەرزبوونەوە (لووتكە شاخ)؛ بڵندبوونەوە.

**rear admiral,** پلەیەكی بەرزی ئەفسەری دەریایییە لەژوور *" كاپتن "ەوەو لەخوار جێگری ئەدمیراڵەوە.*

**rear guard,** پاشكۆی لەشكر؛ پاشڕەوی لەشكر؛ *بەتالیۆنێكە دوای لەشكر دەپارێزێ.*

***rearm (rē-ärm′)***, v.t. & v.i. *(١) سەرلەنوێ پرچەك كردنەوە.*
*(٢) سەرلەنوێ پرچەك كردنەوە بە چەكی چاكترو تازەتر.*

**rearmament** (rē-ärm′ə-mənt), *n.* سەرلەنوێ پرچەك كردنەوە

**rearmost** (rêr′mōst´), *adj.* هەرە دوایی؛ دواترین؛ قرە.

***rearrange (rē′ə-rānj′)***, v.t. *(١) سەرلەنوێ ڕێكخستنەوە.*
*(٢) بە شێوەیەكی جیا یا نوێ ڕێكخستنەوە.*
***-rearrangement*** (n.).

**rear view mirror,** ئاوێنەی دواوە پێ بینین ( لەلایەن ڕانەری ئوتومبیل و ماتۆڕسكیلەوە).

**rearward** (rêr′wôrd´), *n.* (١) جێگەی دواوە.
(٢) [Rare]. پاشەنگی لەشكر؛ پاشەڕۆی لەشكر.

**rearward** (rêr′wẽrd), *adj.* لەدواوە؛ دواوە.
***adv.*** بۆ دواوە؛ بەرەو دواوە؛ لەدواوە.

**rearwards** (rêr′wẽrdz), *adv.* = **rearward.**

**reason** (rē′z'n), *n.* (١) بەڵگە. (٢) هۆ؛ بۆنە.
(٣) مێشك؛ توانای بیركردنەوەو لێكدانەوە. (٤) ژیری.
(٥) گریمانە (ژیربێژی).
***v.i.*** (١) بیركردنەوە؛ لێكدانەوە.
(٢) بە شێوەیەكی بەجێ بیركردنەوە یا پێ سەلماندن.
***v.t.*** (١) بیركردنەوە؛ لێكدانەوە. (٢) گفتوگۆكردن؛ وتووێژكردن؛ باس كردن.
(٣) بەڵگە بۆهێنانەوە؛ ڕەواكردن.
(٤) پێ سەلماندن.

**bring ( a person) to reason,** هێنانەوە سەر ڕێی ڕاست و بیرو كردەوەی نابەجێ پێ وازلێهێنان

**by reason of,** بەهۆی؛ بە بۆنەی.

**in reason,** (١) ڕەوا. (٢) بەجێ

**out of all reason,** نابەجێ؛ بێ جێ؛ بێ مانا.

**reason that,** وا لێكدانەوە؛ لە ئەنجامدا وا بۆ دەركەوتن.

**stand to reason,** دیارە؛ دەچێتە مێشكەوە؛ بەجێیە؛ ڕێی تێ دەچێ.

**with reason,** بێ هۆ نییە؛ لە خۆڕایی نییە؛ بە هەق.

**within reason,** بە ئەندازە؛ تا ڕادەیەكی بەجێ.

**reasonable** (rē′z'n-ə-b'l), *adj.* (١) ژیر؛ باش بیركەرەوە؛ تێگەیشتوو: ***( a ~ person )***.
(٢) بەجێ؛ درووست؛ شیاو؛ پەسەند: ***( a ~ idea, plan, etc. )***.
(٣) گران نییە؛ نرخەكەی بەجێیە.
**-reasonability** ***(n.)***; **resonableness** ***(n.)***.

**reasonably** (rē′z'n-ə-bli), *adv.* (١) بە ژیری؛ بە شێوەیەكی بەجێ و جوان: ***( to think ~ )***
(٢) تا ڕادەیەك: ***( I'm ~ sure.)***.

**reasoning** (rē′z'n-iŋ), *n.* (١) بیركردنەوە؛ لێكدانەوە؛ لێكدانەوەو گەیشتنە ئەنجام. (٢) بەڵگە.

**reasonless** (rē′z'n-lis), *adj.* (١) بێ مێشك؛ بیرنەكەرەوە.
(٢) نابەجێ؛ بێ جێ؛ نادرووست.

**reassurance** (rē´ə-shoor′əns), *n.* (١) دووبارە دڵنیاكردن؛ سەرلەنوێ دڵنیابوون. (٢) دڵنیایی. (٣) سەرلەنوێ بیمەكردن.

**reassure** (rē´ə-shoor′), *v.t.* (١) سەرلەنوێ دڵنیاكردن؛ دڵنیاكردنەوە.
(٢) بیمەكردنەوە؛ دووبارە بیمەكردن.

**reave** (rēv), *v.t.* (١) تاڵآن كردن؛ بەزۆر لێ سەندن و بردن؛ ڕووتكردنەوە.
(٢) لێ سەندن؛ بێ بەش كردن.
***v.i.*** تاڵآن كردن؛ ڕووتكردنەوە.

**reave** (rēv), *v.t.* [Archaic]. شكاندن؛ پارچە پارچە كردن.

**rebate** (rē′bāt, ri-bāt′), *v.t.* (١) (ا) بۆ گەڕاندنەوەی هەندێ لەو پارەیەی دراوە. (ب) هەندێ لە نرخ داشكاندن
(٢) [Rare]، كەمكردنەوە. (٣) [Archaic]، كول كردن (تیغ).
***n.*** پارەی بۆ گەڕێنراوە (پاش كڕینی شتێك و پارەدان)؛ پارەی لە نرخ داشكێنراو:
***( Car salesmen are giving ~s to thier customers.)***

**rebato** (rə-bä′tō), ***n. Also*** **rabato.**

**rebec** (rē′bek), ***n. Also*** **rebeck,** تەموورە؛ ڕەبابە؛ ئامێرێكی مۆسیقی ژێدارە بە كەوان یا بە پەنجە لێدەدرێت.

**rebel** (reb′'l, ri-bel′), *n.* یاخی؛ شۆڕشگێڕ؛ سەرپێچ؛ یاخیگەر.
***adj.*** (١) سەركێش؛ سەرپێچ؛ مل نەدەر؛ یاخی.
(٢) هی یاخی گەران؛ هی شۆڕشگێڕان؛ شۆڕشگێڕی؛ شۆڕشگێڕ:
***( the ~ forces )***
***v.i.*** (١) یاخی بوون؛ شۆڕشگێڕان؛ شۆڕش كردن.
(٢) بەرهەڵستی كردن؛ دژ وەستان؛ لێ هەڵگەڕانەوە؛ بەلەسەبوون.

**rebeldom** (reb′'l-dəm), *n.* (١) ناوچەی یاخیگەران؛ ناوچەی ڕزگاركراو. (٢) یاخیگەران؛ شۆڕشگێڕان.
(٣) كارو ڕەووشتی یاخیگەران.

**rebellion** (ri-bel′yən), *n.* (١) یاخیگەری؛ شۆڕش؛ یاخیگەرێتی.
(٢) بەرهەڵستی؛ مل نەدان؛ دژ وەستان؛ سەرپێچی؛ سەركێشی

**rebellious** (ri-bel′yəs), *adj.* (١) یاخی؛ شۆڕشگێڕ
(٢) یاخییانە؛ شۆڕشگێڕانە.
(٣) سەرپێچ؛ سەركێش؛ بەرهەڵستیكەر؛ لێ هەڵگەڕاوە: ***( a ~ child )***.
(٤) دابین نەكراو ( برین، نەخۆشی): ***( a ~ growth )***.
**-rebelliously** ***(adv.)***; **rebelliousness** ***(n.)***.

**rebirth** (rē-bũrth′, rē′bũrth´), *n.* (١) زیندووبوونەوە لەدوای مردن؛ لەدایكبوونەوە دوای مردن.
(٢) ژیانەوە؛ بزووتنەوە؛ زیندووبوونەوە ( مەجاز):
***( the ~ of the movement for independence )***

**reborn** (rē-bôrn′), *adj.* لەدایكبووەوە؛ زیندووبووەوە؛ تازەبووەوە.

**rebound** (ri-bound′, rē′bound´), *v.i.* (١) هەڵگەڕانەوە؛ گەڕانەوە ( پاش لە شتێك دان): ***( The ball ~ed .)***.
(٢) گەڕانەوە بۆ ئەو كەسە خۆی؛ بۆ گەڕانەوە:

***( Their evil deeds will ~ upon themselves.)***

(٢) خۆگرتنەوە (پاش ژێرکەوتن، نەخۆشی ..هتد)؛ هەڵسانەوە؛

هێز هاتنەوەبەر؛ بزووتنەوە؛ بووژانەوە. ***( His spiritis ~ed.)*** .

(٤) [Rare, Obs.] ، دەنگدانەوە

*v.t.* [Rare], هەڵگەڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە (پاش لە شتێك دان)

*n.* (١) هەڵگەڕانەوە؛ گەڕانەوە ( پاش لەشت دان).

(٢) خۆگرتنەوە (پاش ژێرکەوتن، نەخۆشی، تەلاق)؛ هەڵسانەوە؛ گەڕانەوە؛

بووژانەوەی خێرا

***( He married Jane on the ~ after his wife divorced him.)***

**rebroadcast** (rē-brôd′kast′), *v.t.* (١) سەرلەنوێ بلاوکردنەوە

( بە ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن): ***( to ~ a program )*** .

(٢) وەرگرتن لە ئێستگەیەکی ترو بلاوکردنەوە لەهەمان کاتدا.

*n.* (١) دیسانەوە بلاوکردنەوە. (٢) بەرنامەی سەرلەنوێ بلاوکراوە.

(٣) بەرنامەی وەرگیراو لە ئێستگەیەکی ترەوەو بلاوکراوە لەهەمان کاتدا.

**rebuff** (ri-buf′), *n.* (١) بەرپەرچدانەوە؛ لە لووت دان؛ لە لووت دران؛

وەلام دان ( پێشنیازی یارمەتیدان یا وەرگرتن، خوازبێنی، داواکاری).

(٢) بەرهەڵستی؛ کۆسپ؛ بەربەست.

*v.t.* (١) لە لووت دان؛ بەرپەرچدانەوە؛ ڕێز نەگرتن و خستنە پشت گوێ؛

وەلام دانی کەسێك کە بیەوێ یارمەتی بدات یا وەرگرێ، خوازبێنی بکات،

یا داوایەك یا پێشنیازێکی هەبێت.

(٢) بەرهەڵستی کردن؛ گەڕاندنەوە؛ ڕاونان؛ دەرکردن.

**rebuke** (ri-būk′), *v.t.* (١) بە توندی سەرزەنشتکردن؛ شکاندن؛

پیاهەڵشاخان. (٢) [Obs.]، (ا) بەرهەڵستی کردن؛ گەڕاندنەوە؛ دەرکردن؛

ڕاونان (ب) پەستنەوە؛ پێشێل کردن؛ پێپەستکردن؛ دابینکردن.

*n.* سەرزەنشتی توندوتیژ؛ شکان؛ پیاهەڵشاخان.

**rebus** (rē′bəs), *n.* مەتەڵێکە بریتییە لە وێنەو نیشانەی وەها کە

ناوەکەیان یا دەنگی ناوەکەیان ناوی ووشەی تر بگەیێنێت:

***( A picture of a bedspring followed by a picture of***
***a meadow is a ~ for springfield.).***

**rebut** (ri-but′), *v.t.* (١) بەرپەرجدانەوە ( بە بەڵگە)؛ بەدرۆخستنەوە

***( to ~ an argument, a person, etc. )***

(٢) [Obs.] بەرهەڵستی کردن؛ گەڕاندنەوە دواوە؛ دەرکردن

*v.i.* بەڵگەی پێچەوانە پێشکەش کردن بۆ پەرچدانەوە.

**rebuttal** (ri-but′'l), *n.* بەرپەرچدانەوە (بە بەڵگە)؛ بەرپەرچ.

**rebutter** (ri-but′er), *n.* (١) بەرپەرچدەرەوە

(٢) بەرپەرچی بەهانەو بەڵگەی داواکەر لە دادگادا

**recalcitrance** (ri-kal′si-trəns), *n.* (١) سەرکێشی؛ سەرپێچی؛

مل نەدان؛ کەللەرەقی؛ بەربەرەکانی. (٢) کردەوەیەکی سەرکێشانە یا کەللەرەقانە.

**recalcitrant** (ri-kal′si-trənt), *adj.* سەرکێش؛ سەرپێچ؛

سەرسەخت؛ حەز لە بەربەرەکانی کەر.

*n.* کەسێکی سەرپێچ و بەربەرەکانیکەر.

**recalcitrate** (ri-kal′si-trāt′), *v.i.* سەرپێچی کردن؛

سەرکێشی کردن؛ بەربەرەکانی کردن؛ مل نەدان.

**-recalcitration** *(n.).*

**recalescence** (rē′kə-les′'ns), *n.* بەرزبوونەوەی کوتوپڕی و

سەردەمی پلەی گەرمی و بلێسە سەندنی ئاسن و پۆڵا لەکاتی ساردبوونەوەدا.

**recall** (ri-kôl′, rē′kôl′), *v.t.* (١) بانگ کردنەوە.

***( to ~ an ambassador)***

(٢) بیرخستنەوە؛ خستنەوە یاد

(٣) هەڵوەشاندنەوە ( بڕیار)؛ سڕینەوە؛ لابردن

(٤) بیرکەوتنەوە؛ هاتنەوە بیر (٥) [Poetic]، زیندووکردنەوە

*n.* (١) بانگ کردنەوە: ***( a ~ of their ambassador)*** .

(٢) (ا) بانگ کردنەوەی سەرباز بۆ ئۆردوگا (بە کەرەنا یا تەپڵ):

***( to sound the ~ )***

(ب) بانگ کردنەوەی کەشتی ( بە نیشانە).

(٣) بیرکەوتنەوە؛ هاتنەوە یاد.

(٤) هەڵوەشاندنەوە (بڕیار)؛ سڕینەوە.

(٥) لابردنی کاربەدەستێك یا ئەندامێکی پەرلەمان پێش کاتی خۆی بە دەنگدان؛

مافی ئەم لابردنە:

***( the ~ of a governer or a member of congress)***

**recant** (ri-kant′), *v.t. & v.i.* حاشاکردن: ( لە گوفتارێك یا ڕایەکی

پێشووی خۆ)؛ پێ لە هەڵەی خۆنان و کێشانەوەی بیروڕا یا گوفتاری ڕابوردوو.

**-recantation** *(n.)*; **recanter** *(n.).*

**recap** (rē-kap′), *v.t.* دەورە گرتنەوەی تایەی ئوتومبیل.

*n.* تایەی دەورە گیراو: ***( to use ~s instead of new tires)*** .

**recap** (rē-kap′), *v.t.* ( *short for* **recapitulate**), کورتکردنەوە؛

ووتنەوە بە کورتی؛ دووبارەکردنەوە بە کورتی: ***( to ~ the news )*** .

*n.* کورتە؛ پوختە.

**recapitalize** (rē-kap′ə-t'l-īz′), *v.t.* گۆڕینی بنچینەی سەرمایەی

کۆمپانیایەك.

**recapitulate** (rē′kə-pich′oo-lāt′), *v.t. & v.i.* کورتکردنەوە؛

دووبارەکردنەوەی کورتە یا پوختەی باسێك؛ بە کورتی ووتنەوە:

***( to ~ the main points of a discussion or lecture)***

**recapitulation** (rē′kə-pich′oo-lā′shən), *n.* (١) کورتکردنەوە؛

دووبارەکردنەوەی کورتە یا پوختەی باسێك. (٢) کورتەی باس؛ پوختە.

(٣) پێدا ڕۆیشتنی ئاژەڵەمەیەك بە قۆناغەکانی گۆڕینی تۆخمەکەیدا

**recapture** (rē-kap′cher), *v.t.* (١) (ا)گرتنەوە ( جێی داگیرکراو)؛

داگیرکردنەوە؛ گرتنەوەدەست؛ وەرگرتنەوە؛ لێ سەندنەوە (شتی لەدەست چوو)

(ب) گرتنەوە ( تاوانکار یا بەندی ڕاکردوو).

(٢) لێ سەندنەوە یا دەستبەسەرداگرتنی زیادە قازانجی کۆمپانیایەك لەلایەن

میرییەوە. (٣) هێنانەوە بەرچاوی خۆ ( ڕابوردوو، بەسەرهاتی ڕابوردوو)؛

سەرلەنوێ چەشتنەوە: ***( to ~ an experience or an emotion)***

*n.* (١) (ا) گرتنەوە ( شوێنی داگیرکراو، بەند یا دیلی ڕاکردوو)؛

سەندنەوەی شتی لەدەست چوو. (ب) گیرانەوە. (٢) تالانی سەندنەوە.

(٣) شتی لێ سەنراوە؛ شتی گەڕێنراوە یا گەڕاوە.

(٤) دەستبەسەرداگرتن یا لێ سەندنەوەی زیادە قازانجی کۆمپانیایەك لەلایەن

میرییەوە.

**recast** (rē-kast′), *v.t.* (١) داڕشتنەوە؛ داڕێژانەوە: ***( to ~ a gun)*** .

(٢) داڕشتنەوە ( ڕشتە، ووتار)؛ چاك کردن و دووبارە نووسینەوە؛ دەست لێدان

***( to ~ a sentence, paragraph, speech, etc. )***

(٣) سەرلەنوێ ژماردن؛ ژماردنەوە: ***( to ~ a column of figures)***

(٤) دابەش کردنەوەی بەشەکانی شانۆنامەیەك: ***( to ~ a play)***

*n.* (١) داڕشتنەوە؛ سەرلەنوێ داڕشتن؛ داڕێژانەوە.

(٢) داڕێژەی تازە؛ شتی دووبارە داڕێژراو.

**recede** (ri-sēd′), *v.i.* (١) کشانەوە؛ گەڕانە دواوە؛ نیشتنەوە (ئاو).

***( The flood water ~d.)***

(٢) **( ~ from)** ، لێ کشانەوە؛ لێ پەشیمان بوونەوە ( پەیمان، ڕێکەوتن):

***( He ~d from his bargain. )***

(٣) بەدوادا داچوون ( چەناگە).

(٤) بایەخ یا گرنگی کەم بوونەوە: ***( to ~ into the background )***

(٥) لەبیرچوونەوە؛ دوورکەوتنەوە: ***(memories of childhood ~ )***

**receipt** (ri-sēt′), *n.* (١) (ا) وەرگرتن. (ب) وەرگیران.

(٢) (*pl.*)، سەرجەمی شتی وەرگیراو. (٣) ڕەسید؛ وەرگرتن نامە.

(٤) [Dial.] ، **recipe** .

*v.t.* (١) نیشانەکردن یا کوژاندنەوەی قەرزی دراوە.

(٢) ڕەسید پێدان یا بۆ نووسین.

*v.i.* ڕەسید نووسین یا پێدان.

**receivable** (ri-sēv′ə-b'l), *adj.* (١) وەردەگیرێ لەباتی فرۆتنی یا

قەرز؛ دەشێ وەرگیرێ. (٢) کاتی دانەوەیەتی (قەرز): ***( accounts ~ )*** .

تاوانکار؛ دەزگایەکە وەك بەندیخانە وایە بۆ تەمیٚ کردن‌و خستنەوەسەر ڕیٚی
ڕاستی هەرزەی تاوانکار

**reformed** (ri-fôrmd′), *adj.* (١) سەر ڕیٚی ڕاست خراو؛
ڕەووشت‌و کردار چاك بوو: ***( a ~ criminal )*** .
(٢) [R-]، هی کلێسەی پرۆتستانتی.

**reformer** (ri-fôr′mēr), *n.* (١) چاککەرەوە؛ ڕاستکەرەوەی دەزگای
کومەلایەنی‌و ڕامیاری. (٢) یەکێك لە سەرۆکەکانی بزووتنەوەی ئاین‌و
ڕاستکردنەوەو دامەزراندنی کلێسەی پرۆتستانتی لە ئەورووپادا.

**reformist** (ri-fôrm′ist), *n.* چاککەرەوە؛ ڕاستکەرەوەی دەزگای
کۆمەلایەنی‌و ڕامیاری.

**reform school,** = reformatory.

**refract** (ri-frakt′), *v.t.* شکانەوە ( تیشکی ڕووناکی. داری ناو ئاو).

**refraction** (ri-frak′shən), *n.* (١) شکانەوە . تیشکی ڕووناکی.
داری ناو ئاو. هتد) (٢) لادانی تیشکی ڕۆژ یا ئەستێرە لە ڕێڕەوی خۆی
(ئەستێرەناسی).

**-refractional** ***(adj.)***; **refractive** ***(adj.)***.

**refractometer** (rē′frak-tom′ə-tēr), *n.* پێوەری شکانەوەی
تیشکی ڕووناکی

**refractory** (ri-frak′tə-ri), *adj.* (١) سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ لاسار؛
سەرکێش. (٢) بە ئاسانی ناتوێتەوە ( کانزا)؛ بەرهەلستی گەرما دەکات.
(٣) دەرمان کاری تیٚ ناکات ( نەخۆشی)؛ چارەکردنی گرانە.
(٤) بەرهەلستی نەخۆشی دەکات؛ نەخۆش ناکەوێت.

**refrain** (ri-frān′), *v.i.* خۆڕاگرتن؛ ڕیٚ بە خۆ نەدان؛ نەهێشتن:
***( to ~ from making any hostile comment )***

***v.t.*** [Archaic], ڕیٚ لێگرتن؛ ڕاگرتن؛ وەستاندن.

**refrain** (ri-frān′), *n.* (١) ئەو بەشەی هەلبەستێك کە دووبارە
دەکرێتەوە؛ ئەو بەشەی گۆرانی‌یەك کە کۆرەس دەیسەنێتەوە یا دەیلێتەوە.
(٢) مۆسیقای ئەم بەشەی گۆرانی.

**refrangible** (ri-fran′jə-b′l), *adj.* دەشکێتەوە ( تیشکی ڕووناکی)؛
دەتوانری بشکێنرێتەوە.

**-refrangibility** ***(n.)***.

**refresh** (ri-fresh′), *v.t.* (١) بووژاندنەوە ( بە خواردن، خواردنەوە،
نووستن هتد)؛ ژیانەوە؛ گەشەپێکردن.
(٢) فێنك کردنەوە؛ تازەکردنەوە (هەوای ژوور).
(٣) بیرخستنەوە؛ خستنەوە یاد: ***( to ~ one's memory )*** .

***v.i.*** (١) بووژانەوە؛ ژیانەوە؛ گەشەکردن. (٢) خواردن؛ خواردنەوە.
(٣) ئارەزووی تازە خستن.

**refresher** (ri-fresh′ēr), *n.* شتی بووژێنەرەوە یا فێنککەرەوە.

***adj.*** دەمەزەردکەرەوە ( مەجان)؛ تازەکەرەوە؛
بیرخەرەوە ( شتی لە دەمێکەوە خوێنراو): ***( a ~ course )***

**refreshing** (ri-fresh′iŋ), *adj.* (١) خۆش؛ فێنککەرەوە؛
بووژێنەرەوە ***( a ~ drink )*** .
(٢) تازە؛ لەمەوپێش نەبیستراو یا نەبینراو؛ جیا؛ نائاسا:
***( a ~ point of view )***

**refreshment** (ri-fresh′mənt), *n.* (١) بووژانەوە؛ ژیانەوە؛
گەشەپێکردن. (٢) بووژێنەرەوە ( خواردەمەنی. خواردنەوە).
(٣) ( *pl* ) ، ساردەمەنی؛ خواردن‌و خواردنەوەیەکی سووك.

**refrigerant** (ri-frij′ēr-ənt), *adj.* (١) ساردکەرەوە
(٢) لەش فێنککەرەوە؛ تا کەمکەرەوە؛ تا هێنەرەخوارەوە.

***n.*** (١) دەرمانی تا؛ دەرمانی تا سووککەر.
(٢) ماددەی ساردکەرەوە ( لە بەفرخەری کارەباییدا بەکاردەهێنرێت).

**refrigerate** (ri-frij′ə-rāt′), *v.t.* (١) ساردکردن
(٢) خواردەمەنی‌و خواردنەوە ساردکردن بۆ پاراستنی.

**refrigeration** (ri-frij′ə-rā′shən), *n.* سارکردنی خواردەمەنی‌و
خواردنەوە بۆ پاراستنی.

**refrigerator** (ri-frij′ə-rā′tēr), *n.* بەفرخەری کارەبایی؛ بەخچاڵ؛
بەفرگر؛ سەهۆلدان.

**refringent** (ri-frin′jənt), *adj.* شکێنەرەوە ( تیشکی ڕووناکی)؛
شکاوە.

**reft** (reft), *alternative past tense and p.p. of* **reave.**

***adj.*** لێ سەنراو، بیٚ بەش کراو.

**refuel** (rē-fū′əl), *v.t.* سووتەمەنی تازە تێکردن.

***v.i.*** سووتەمەنی تازە تێکران یا وەرگرتن.

**refuge** (ref′ūj), *n.* پەنا؛ داڵدە؛ پەناگا؛ لانە؛ پەرێز.

to give **refuge,** داڵدەدان؛ پەنادان.

to take **refuge,** پەنا بردنە بەر؛ داڵدە بۆهێنان؛ داڵدە بۆ بردن.

**refugee** (ref′yoo-jē′), *n.* پەنابەر؛ پەناهەندە؛ بیٚ لانە؛ ئاوارە.

**refulgence** (ri-ful′jəns), *n.* بریقە؛ بریسکە؛ درەوشانەوە.

**refulgent** (ri-ful′jənt), *adj.* بریقەدار؛ درەوشاوە؛ بریسکەدار.

**refund** (ri-fund′), *v.t.* پارە بۆ گەڕاندنەوە.

***n.*** پارەی بۆ گەڕێنراوە؛ پارە بۆ گەڕاندنەوە.

**refund** (rē′fund′), *v.t.* (١) سەرلەنویٚ پارە پێدان؛
پاڵپشتی کردنەوە بە پارە. (٢) قەرزدانەوە بە وەرگرتنی قەرزێکی تازە

**refurbish** (rē-fūr′bish), *v.t.* تازەکردنەوە؛ نویٚ کردنەوە ( خانوو،
پەلەم).

**-refurbishment** ***(n.)***.

**refusal** (ri-fū′z′l), *n.* (١) نەویستن؛ پەسەند نەکردن؛ ڕازی نەبوون.
(٢) مافی پەسەندکردن یا نەکردن.

**refuse** (ri-fūz′), *v.t.* (١) نەویستن؛ پەسەند نەکردن:
***( to ~ an offer )***
(٢) ڕازی نەبوون؛ نەکردن؛ بە قسە نەکردن: ***( to ~ to go )*** .
(٣) مل نەدان. (٤) سڵ کردنەوەو باز نەدان ( ئەسپ).

***v.i.*** ڕازی نەبوون؛ پەسەند نەکردن؛ نەکردن؛ نەویستن.

**refuse** (ref′ūs, ref′ūz), *n.* پاشەڕۆك؛ سەرکۆزەر؛ پاشماوە؛ زبڵ.

***adj.*** نەویستراو؛ فڕێدراو.

**refutable** (ref′yoo-tə-b′l), *adj.* بەرپەرچ دەدرێتەوە؛
بە درۆ دەخرێتەوە.

**refutation** (ref′yoo-tā′shən), *n.* بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.

**refute** (ri-fūt′), *v.t.* بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.

**regain** (ri-gān′), *v.t.* (١) دەست کەوتنەوە؛ چنگ کەوتنەوە؛
وەرگرتنەوە؛ هاتنەوە دەست:
***( to ~ consciousness, confidence, control, etc.)***
(٢) سەرلەنویٚ گەیشتنە شوێنێك؛ گەیشتنەوە.

**regal** (rē′g′l), *adj.* (١) پادشایانە.
(٢) جوان؛ بۆ پاشا شیاو؛ لە پاشا هاتوو.

**-regally** ***(adv.)***.

**regale** (ri-gāl′), *v.t.* (١) خۆشی پێدان؛ دڵخۆش کردن.
(٢) خواردن‌و خواردنەوەی نایاب پێشکەش کردن.

***v.i.*** خواردنی زۆرو نایاب خواردن.

***n.*** [Obs.], (١) خوانێکی نایاب؛ خواردن‌و خواردنەوەی زۆرو نایاب.
(٢) خواردن یا خواردنەوەی هەڵبژاردە؛ جۆرە خواردنێکی نایاب.
(٣) ساردەمەنی.

**regalia** (ri-gā′li-ə, ri-gāl′yə), *n.* (١) مافی پاشایەتی؛ مافی پاشا.
(٢) درووشم‌و نیشانەی پاشایەتی ( وەك تاج‌و گورزی پاشا...هتد).
(٣) گێزوگوڵنگ‌و بەرگی تایبەتی پلەوپایەیەك یا چینێکی تایبەتی:
***( The general in his full ~ reviewed the troops.)***
(٤) جل‌وبەرگی جوان‌و تایبەتی.

**regality** (ri-gal′ə-ti), *n.* (١) پاشایەتی. (٢) پاشانشین.
(٣) مافی پاشا؛ مافی پاشایەتی.

**regard** (ri-gärd′), *n.* (١) سەیرکردن؛ تەماشاکردن؛ تەماشا؛

چاو تێ بڕین. (٢) گوێ پێدان؛ باك؛ بەتەنگەوەهاتن؛ سەرنج:
***( with special ~ to your saftety )***
(٣) ڕێز: ***( He had high ~ for his teachers.)*** .
(٤) دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ لەبابەت؛ ڕوو: ***( in ~ to your question )*** .
(٥) (*pl.*) ، سڵاو؛ ڕێزو سڵاو:
***( Please give my ~s to your brother.)***
***v.t.*** (١) چاوتێ بڕین؛ سەیرکردن؛ تەماشاکردن. (٢) ڕەچاوکردن؛ لێکدانەوە.
(٣) سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان.
(٤) ڕێزلێگرتن؛ ڕێز بۆ هەبوون: ***( He ~s his brothers highly.)*** .
(٥) وا سەیرکردن؛ وا دانان: ***( I ~ this as a opportunity.)*** .
(٦) پەیوەندی پێوە بوون: ***( This proposal ~s your welfare.)*** .
(٧) [Obs.]، بەتەنگەوەهاتن.
***v.i.*** (١) سەیرکردن: چاو تێ بڕین. (٢) سەرنج پێدان؛ گوێ پێدان.
**as regards,** دەربارەی؛ لەڕووی؛ سەبارەت بە؛ لە بابەت.
**in regard to,** دەربارەی؛ لەڕووی؛ سەبارەت بە.
**with regard to = in regard to.**
**without regard to,** بێ گوێ دان بە
**regardful** (ri-gärd′fəl), ***adj.*** (١) بە سەرنج؛ بە گوێ.
(٢) ڕێز پیشاندەر؛ ڕێزگر.
**regarding** (ri-gär′diŋ), ***prep.*** دەربارەی؛ لەڕووی؛ سەبارەت بە.
**regardless** (ri-gärd′lis), ***adj.*** بێ گوێ دان بە؛ بێ سەرنج دان بە:
***( ~ of the cost )***
***adv.*** [Colloq.], لەگەڵ ئەوەشدا؛ بێ گوێ دان بە.
**regatta** (ri-gat′ə), ***n.*** (١) پێشبڕکێی بەلەم.
(٢) چەند پێشبڕکێیەکی بەلەم.
**regelate** (rē′jə-lāt′), ***v.i.*** (١) بەستنی دوو پارچە سەهۆڵ پێکەوە بە پەستانەوە (٢) توانەوەو سەرلەنوێ بەستنەوەی دوو پارچە سەهۆڵ بە پەستنەوە.
**regelation** (rē′jə-lā′shən), ***n.*** (١) بەستنی دووپارچە سەهۆڵ پێکەوە بە پەستنەوە (٢) توانەوەو سەرلەنوێ بەستنەوەی دوو پارچە سەهۆڵ بە پەستانەوە
**regency** (rē′jən-si), ***n.*** (١) پلەوپایەودەسەڵاتی پێ سپێرراوی تەختی پاشایی؛ جێنشینی تەختی پاشایی. (٢) ئەنجوومەنی پێ سپێرراوی تەختی پاشایی. (٣) وڵاتێکە کە جێنشین یا پێ سپێرراوی تەختی پاشایی بیبات بەڕێوە. (٤) ماوەی پێ سپاردنی تەختی پاشایی.
**regeneracy** (ri-jen′ēr-ə-si), ***n.*** تازەبوونەوە؛ بووژانەوە.
**regenerate** (ri-jen′ēr-it, ri-jen′ə-rāt′), ***adj.*** (١) تازە لەدایك بووەوە ( مەجاز. (٢) تازەبووەوە؛ بووژاوە.
***v.t.*** (١) لەدایکبوونەوە ( مەجاز. (٢) بووژاندنەوە؛ تازەکردنەوە؛ چاککردنەوە.
(٣) دامەزراندنەوە. (٤) پڕکردنەوە ( باتری).
(٥) هەڵدانەوە ( ڕووەکناسی؛ زیندەوەرزانی).
***v.i.*** (١) تازەبوونەوە؛ بووژانەوە؛ هەڵدانەوە ( ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی).
(٢) لەدایکبوونەوە ( مەجاز).
**regeneration** (ri-jen′ə-rā′shən), ***n.*** (١) تازەبوونەوە؛ بووژانەوە؛ هەڵدانەوە ( ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی). (٢) لەدایکبوونەوە (مەجاز).
(٣) پڕکردنەوە ( باتری)؛ ووزە پێدانەوە.
**regenerative** (ri-jen′ə-rā′tiv), ***adj.*** (١) تازەکەرەوە؛ بووژێنەرەوە.
(٢) تایبەتی بە تازەبوونەوە یا بووژانەوە.
**regent** (rē′jənt), ***adj.*** تایبەتی بە پێ سپێرراو یا جێنشینی تەختی پاشایی: ***( prince ~ )*** .
***n.*** (١) پێ سپێرراوی تەختی پاشایی؛ جێنشینی پاشا.
(٢) ئەندامی ئەنجوومەنی سەرپەرشتیکەرانی زانکۆ ( کە لە بەناوبانگانی کۆمەڵ دادەمەزرێت) (٣) [Obs.]، فەرمانڕەوا.
**-regentship** ***(n.).***
**regicide** (rej′ə-sīd′), ***n.*** (١) پاشاکوژ؛ پاشای وڵاتی خۆ کوژ.
(٢) پاشاکوژی؛ پاشا کوشتن.
**-regicidal** ***(adj.).***
**regime** (ri-zhēm′, rā-zhēm′), ***n.*** (١) ڕژێم؛ فەرمانڕەوایی؛ شێوەی فەرمانڕەوایی. (٢) پارێز (تەندروستی).
**regimen** (rej′ə-men′, rej′ə-mən), ***n.*** (١) ڕژێم؛ فەرمانڕەوایی؛ شێوەی فەرمانڕەوایی. (٢) پارێز.
(٣) [Rare]، کارتێکردنی ووشەیەك لەسەر ووشەیەکی تر (ڕێزمان).
**regiment** (rej′ə-mənt, rej′ə-ment′), ***n.*** (١) فەوج (سوپا).
(٢) ژمارەیەکی زۆر خەڵك. (٣) [Obs.]، فەرمانڕەوایی.
***v.t.*** (١) فەوج پێکهێنان؛ کردن بە فەوج فەوج.
(٢) لە فەوجدا دانان؛ دامەزراندن لە فەوجدا.
(٣) ڕێکخستن؛ دەستە دەستە کردن.
(٤) هێنانە ژێر باری یەك ڕژێم یا پەیڕەو.
**-regimental** ***(adj.).***
**regimentals** (rej′ə-men′t'lz), ***n.pl.*** (١) بەرگو کێزوگوڵنگی تایبەتی بە فەوجێك. (٢) جل‌وبەرگی سوپایی.
**regimentation** (rej′ə-men-tā′shən), ***n.*** هێنانە ژێر باری یەك ڕژێم یا پەیڕەو؛ بە ووردی لەسەر یەك پەیڕەو ڕۆیشتن.
**reginal** (ri-jī′n'l), ***adj.*** ژنە پاشایی؛ بانووشایی؛ شاژنی.
**region** (rē′jən), ***n.*** (١) ناوچەی زەمین.
(٢) ناوچەی وڵات؛ ناوچە؛ هەرێم.
(٣) ناوچەی لەش؛ بەش؛ ناوچە: ***( the abdominal ~ )*** .
(٤) مەیان ( زانستیو هونەر یا چالاکی تر).
**regional** (rē′jən-'l), ***adj.*** (١) ناوچەیی؛ تایبەتی بە ناوچەیەکی سەرزەمین. (٢) ناوخۆیی؛ تایبەتی بە ناوچەیەکی بچووكو ناوخۆ:
***( a ~ dialect )***
**-regionally** ***(adv.).***
**regionalism** (rē′jən-'l-iz'm), ***n.*** (١) ناوچەگەری؛ ناوچەپەرستی.
(٢) تایبەخۆی ناوچە. (٣) ناوچەگەری لە وێژەو هونەردا.
**register** (rej′is-ter), ***n.*** (١) تۆمارنامە؛ لیستەی شتی تۆمارکراو.
(٢) خانەی تۆمارنامەیەك؛ دانەیەك لە ناوەڕۆکی تۆمارنامە.
(٣) تۆمارکەر؛ تۆمارکار. (٤) تۆمارکردن؛ تۆمارکاری.
(٥) مەکینەی تۆمارکەر؛ مەکینەی ژمێرەر: ***( a cash ~ )*** .
(٦) مەودای مۆسیقا یا دەنگ.
***v.t.*** (١) تۆمارکردن.
(٢) پیشاندان: ***( The thermometer ~s fifty degrees.)*** .
(٣) دەربڕین؛ پیشاندان: ***( His face –ed surprise, anger, etc.)*** .
(٤) تۆمارکردن ( پۆستە، نامە).
***v.i.*** (١) ناو نووسین ( لە تۆمارنامەدا)؛ ناوی خۆ تۆمارکردن.
(٢) ناوی خۆ نووسین ( بۆ دەنگدان لە هەڵبژاردنێکدا).
**registered** (rej′is-tērd), ***adj.*** (١) تۆمارکراو.
(٢) تۆمارکراو ( پۆستە): ***( ~ mail; a ~ letter )*** .
(٣) تایبەتی بە ئەسپو سەگی ڕەسەن ( کە ناوەکەیان دەنووسرێ لەناو تۆمارنامەی زاوزێ پێ کەرەکەیاندا). (٤) مۆرکراو؛ بڕواپێکراو.
**registrant** (rej′is-trənt), ***n.*** تۆمارکەر.
**registrar** (rej′i-strär′), ***n.*** تۆمارکار ( زانکۆ، دادگا)؛ کاربەدەستی تۆمارکاری.
**registration** (rej′i-strā′shən), ***n.*** (١) تۆمارکردن؛ تۆمارکاری.
(٢) دانەیەك لە ناوەڕۆکی تۆمارنامە.
(٣) سەرجەمی خەڵکی ناو تۆمارکراو.
**registry** (rej′is-tri), ***n.*** (١) تۆمارکردن؛ تۆمارکاری.
(٢) فەرمانگەی تۆمارکاری؛ تۆمارخانە.
(٣) تۆمارنامە.
(٤) ناسنامەی کەشتی ( کە بە ئاڵای وڵاتەکەی خاوەنیدا دیارە).
**regius professor,** مامۆستایەکی هەندێ زانکۆی ئینگلتەرەو

نوسکرتلەندەیە کە موورچەکەی لە بەخشیشێکی شاهانە بۆ ئەو زانکۆیە دەدرێت.

**reglet** (reg′lit), *n.* (١) تیلماسکێکی ڕازێنەرەوەیە ( خانووسازی).
(٢) تیلماسکێکی دارە بۆ جیاکردنەوەی دێڕی تیپ ( چاپەمەنی).

**regnal** (reg′nəl), *adj.* پاشایی؛ تایبەتی بە پاشاو ماوەی فەرمانڕەوایی‌یەکەی.

**regnant** (reg′nənt), *adj.* (١) لەسەر تەخت؛ فەرمانڕەوا:
***( the King ~ )***
(٢) زاڵ؛ باو؛ بە برەو؛ بە باو: ***( the ~ fashion )*** .
(٣) بڵاو؛ هەموو شوێنێکی گرتووەتەوە.

**regorge** (ri-gôrj′), *v.t.* (١) ڕشانەوە؛ هێنانەوە ( بەدەم).
(٢) [Rare]، قووتدانەوە؛ سەرلەنوێ قووتدان.
*v.i.* گەڕانەوە ( ئاو)

**regrate** (ri-grāt′), *v.t.* (١) کڕینی خواردەمەنی و شتومەکی ترو فرۆشتنەوەی بە قازانج لە هەمان بازاڕدا یا لە بازاڕی دەوروپشتدا.
(٢) فرۆشتنەوەی شتومەکی بەم جۆرە کڕراو بە قازانج

**regress** (rē′gres, ri-gres′), *n.* (١) گەڕانە دواوە؛ کشانەوە.
(٢) مافی گەڕانە دواوە یا کشانەوە.
*v.i.* گەڕانە دواوە؛ کشانەوە.

**regression** (ri-gresh′ən), *n.* (١) گەڕانە دواوە؛ کشانەوە.
(٢) گەڕانەوە بۆ شێوەیەکی سەرەتایی ( زیندەوەرزانی).
(٣) دانەدواوە ( دەروونناسی)؛ گەڕانەوە بۆ دۆخ یا سەردەمی ڕابووردوو.

**regressive** (ri-gres′iv), *adj.* (١) گەڕانەوەیی؛ کشانەوەیی.
(٢) گەڕاوە دواوە؛ کشاوە؛ بەرەو دواوە ڕۆیشتوو: ***( ~ behavior )*** .
(٣) ڕێژەکەی کەم دەبێتەوە بە زیادبوونی ئەو پارەیە یا سەرمایەیەی باجی لەسەر دەدرێت: ***( a ~ tax )*** .
**-regressively** *(adv.)*; **regressiveness** *(n.)*.

**regret** (ri-gret′), *v.t.* (١) داخ بۆ خواردن.
(٢) پەشیمان بوونەوە؛ پەشیمانی دەربڕین؛ پاشگەز بوونەوە.
*n.* (١) داخ؛ ئاخ‌وداخ. (٢) پەشیمانی؛ پەشیمان بوونەوە؛ پاشگەزی.

**regretful** (ri-gret′fəl), *adj.* پەشیمان؛ ئاخ و داخ هەڵکێش؛ پاشگەز.

**regrettable** (ri-gret′ə-b'l), *adj.* جێی داخە؛ حەیف؛ جێی پەشیمانی‌یە: ***( a ~ incident )*** .

**regrettably** (ri-gret′ə-bli), *adv.* بە داخەوە؛ داخەکەم.

**regroup** (rē-grōōp′), *v.t. & v.i.* یەککگرتنەوە؛ سەرلەنوێ کۆبوونەوەو خۆ ئامادەکردن بۆ هەنگاوی ئایندە.

**regular** (reg′yoo-lẽr), *adj.* (١) ئاسایی؛ دەستووری؛ ناجیاواز.
(٢) ئاسایی؛ هەروەك خۆی یا جاران: ***( He sat in his ~ place.)*** .
(٣) سەرووەر؛ هەمیشەیی: ***( a ~ customer )*** .
(٤) ڕێك‌وپێك؛ نەگۆڕ: ***( a ~ pulse; ~ speed )*** .
(٥) دەستووری؛ لەسەر پەیڕەوێکی تایبەتی‌یە؛ بەجێ.
(٦) ڕێك‌وپێك ***( ~ meals )*** .
(٧) ئاسایی: ***( a ~ doctor )*** .
(٨) [Colloq.]، تەواو، ئێجگار زۆر: ***( a ~ nuisance )*** .
(٩) [Colloq.]، چاك؛ باش؛ پشت پێ بەستراو؛ ڕووخۆش.
(١٠) هی ووشکەسۆفی؛ تایبەتی بەو پیاوە ئاینی‌یانەی لە پەرستگادا دەژین:
***( the ~ clergy )***
(١١) ئاسایی ( ڕێزمان)؛ بێ هێز ( کردار):
***( The verb " go" is not ~ .; " Love" is a ~ verb.)***
(١٢) چوونیەك ( ئەندازە)؛ گۆشەکان و لاکانی هەموو چوون یەکن.
(١٣) یاسایی ( سوپا، سەربان): ***( a ~ army )*** .
(١٤) دڵسۆز ( ئەندامی حیزب)؛ پەیڕەویکەری حیزب.
*n.* (١) ووشکەسۆفی. (٢) سەربازی یاسایی.
(٣) [Colloq.]: کەسێکی خو و ڕەووشت نەگۆڕ.
(٤) ئەندامێکی پەیڕەویکەری حیزب.

**regularity** (reg′yoo-lar′ə-ti), *n.* ڕێك‌وپێکی؛ چوونیەکی.

**regularize** (reg′yoo-lə-rīz′), *v.t.* ڕێك‌وپێك کردن؛ بەپێی یاسا یا پەیڕەو جێبەجێکردن.

**regularly** (reg′yoo-lẽr-li), *adv.* (١) بە ڕێك‌وپێکی.
(٢) ناوبەناوو بە ڕێك‌وپێکی؛ هەمیشە: ***( He writes his family ~ .)***

**regulate** (reg′yoo-lāt′), *v.t.* (١) ڕێك‌وپێك کردن؛ ڕێکخستن؛ گونجاندن؛ پەیڕەو بۆ دانان: ***( to ~ the heat )*** .
(٢) چاك کردن: ***( to ~ a watch )*** .
(٣) بە ڕێك‌وپێکی بەڕێوەبردن: ***( to ~ traffic )*** .

**regulation** (reg′yoo-lā′shən), *n.* (١) ڕێك‌وپێك کردن؛ گونجان.
(٢) پەیڕەو.

**regulator** (reg′yoo-lā′tẽr), *n.* ڕێکخەر: (ا) ئامێری ڕێکخەر ( پلەی ڕۆیشتنی ئاوو ئەلەکتریك و گاز...هتد). (ب) ڕێکخەری کاتژمێر.

**regulatory** (reg′yoo-lə-tôr′i, reg′yoo-lə-tō′ri), *adj.* هی ڕێکخستن؛ ڕێکخەر؛ تایبەتی بە ڕێك‌وپێك کردن.

**regulus** (reg′yoo-ləs), *n.* (١) ئەستێرەیەکە لە کۆنەستێرەی " شێر".
(٢) (ا) ئەنتیمۆن: توخمێکی کیمیایی‌یە. (ب) خڵتەی کانزا.
(ج) کانزای نەختێك پاك کراوە.

**regurgitate** (rē-gũr′jə-tāt′), *v.i.* بۆ دواوە چوون؛ تەووژم دان بۆدواوە.
*v.t.* هێنانەوەی خواردەمەنی لە سکەوە بۆ ناو دەم ( بۆ کاوێژکردن یا بۆ دان بە بەچکە وەك هەندێ باڵندە)؛ ڕشانەوە.
**-regurgitant** *(adj.)*; **regurgitation** *(n.)*.

**rehabilitate** (rē′hə-bil′ə-tāt′), *v.t.* (١) سەرمایەو پلەوپایەو ماف بۆ گەڕاندنەوە. (٢) ناوبانگی باش پێدانەوە پاش ناوزڕان.
(٣) چاك کردنەوە ( خانوو، ووڵاتی وێران کراو پاش جەنگ)؛ بووژانەوە؛ ئاوەدانکردنەوە. (٤) گەڕانەوە بۆ دۆخی باشی جاران:
***( to ~ a prisoner after his release )***
**-rehabilitation** *(n.)*.

**rehash** (rē-hash′), *v.t.* داڕشتنی شتی کۆن بە شێوەیەکی تازە (بەتایبەتی لە پەخشان و هۆنراوەو باسی تردا).
*n.* (١) داڕشتنی باسی کۆن بەشێوەیەکی تازە.
(٢) باسی کۆنی داڕێژراو بەشێوەیەکی تازە:
***( The new article is just a ~ of old material .)***

**rehearsal** (ri-hũr′s'l), *n.* (١) گێڕانەوە:
***( a ~ of her trouble )***
(٢) تاقیکردنەوە؛ مەشق؛ پەراوە.
(٣) پەراوە ( شانۆنامە): ***( the ~ of a play )*** .
**in rehearsal,** لە پەراوەدایە ( شانۆنامە).

**rehearse** (ri-hũrs′), *v.t.* (١) بە دەنگی بەرز خوێندنەوە.
(٢) گێڕانەوە ( بەسەرهات).
(٣) پەراوەکردن ( شانۆنامە): ***( to ~ a play)*** .
(٤) مەشق پێکردن؛ مەشق کردن.
*v.i.* پەراوەکردن ( شانۆنامە، ووتار...هتد).

**reich** (rīk), *n.* (١) ئیمپراتۆرنشینی ئەڵمانیا لە سەدەی نۆهەمەوە هەتا ساڵی ١٨٠٦ ( ڕایخی یەکەم). (٢) ئەڵمانیا: (ا) ئیمپراتۆرنشینی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٧١- ١٩١٩ ( ڕایخی دووهەم). (ب) کۆماری ئەڵمانی لە ساڵی ١٩١٩- ١٩٣٣. (ج) ئەڵمانیای نازی لە ساڵی ١٩٣٣- ١٩٤٥ ( ڕایخی سێهەم).

**reichsmark** (rīks′märk′), *n.* مارکی ئەڵمانی: دراوی ئەڵمانیایە.

**reify** (rē′ə-fī′), *v.t.* شتی ڕووت یا بێ قەبارە بە شتی قەبارەدار دانان.
**-reification** *(n.)*.

**reign** (rān), *n.* (١) دەسەڵاتی شاهانە؛ دەسەڵاتی بێ سنوور؛ دەسەڵات.
(٢) زاڵی؛ بڵاوی؛ دەسەڵاتداری؛ بە برەوی: ***( the ~ of fashion )*** .
(٣) ماوەی فەرمانڕەوایی پاشایەك.
(٤) فەرمانڕەوایی: ***( the ~ of terror )*** .
(٥) [Rare]، شانشین.

*v.i.* (۱) فەرمانڕەوایی کردن وەك پاشا؛ پاشایی کردن.
(۲) سەرکەوتن؛ بە برەو بوون؛ زاڵبوون: *( Peace ~s. )* .

**Reign of Terror,** (۱) سەردەمی تۆقاندن لەکاتی شۆڕشی فەرەنسادا
لە ساڵی ۱۷۹۳-۱۷۹٤ کە سەری گەلێك کەسی تێدا پەڕێنرا.
(۲) [r- (-)]، سەردەمی خوێن ڕژان و تۆقاندن.

**reimburse** (rē´im-bûrs′), *v.t.* بۆ بژاردنەوەی پارەو زیان؛
پارە پێدانەوە بە کەسێك ( لەباتی ئەو پارەیەی داوێتی یا ئەو زیانەی لێی
کەوتووە) *( The company will ~ you for any loss.)* .
**-reimbursable** *(adj.)*; **reimbursement** *(n.)*.

**reimpression** (rē´im-presh′ən), *n.* لە چاپدانی دووەمی
پەڕتووکێك.

**rein** (rān), *n.* (۱) جڵەو؛ سەرکەللە.
(۲) جڵەو ( مەجاز)؛ هۆی دابینکردن:
*( the ~s of government; the ~s of power )*
*v.t.* (۱) جڵەوکردن (۲) دابینکردن؛ لغاوکردن ( مەجاز).
*v.i.* (۱) وەستاندن یا هێواش کردنەوە بە جڵەو.
(۲) [Rare]، ملدان ( ئەسپ)؛ سەرپێچی نەکردن؛ ملکەچ کردن.
**draw rein,** *Also* **draw in the reins,** (۱) جڵەوگرتن؛ جڵەوڕاکێشان؛
جڵەو توندکردنەوە. (۲) وەستاندن؛ هێواش کردنەوە.
**give (free) rein to,** جڵەو بۆ شل کردن؛ بەر بۆ بەرەڵاکردن؛
جڵەو بۆ بەرەڵاکردن؛ بەدەمەوەدان.
**keep a rein on,** جڵەو توندکردنەوە؛ جڵەوگرتن؛ دابینکردن.

**reincarnate** (rē´in-kär′nāt), *v.t.* زیندووکردنەوە.

**reincarnation** (rē´in-kär-nā′shən), *n.* (۱) زیندووبوونەوە؛
زیندووکردنەوە. (۲) بڕوای زیندووبوونەوەی مرۆڤ پاش مردن.

**reindeer** (rān′dêr´), *n.* ئاسکی شاخە پەلکدار.

**reinforce** (rē´in-fôrs′, rē´in-fōrs′), *v.t.* (۱) بەهێزکردن (بنکەی
سوپایی)؛ سەربازو چەکی تازە بۆ ناردن. (۲) زیادکردن.
(۳) داگرتنەوە ( تیکی پەراوێن). (٤) توندکردنەوە؛ قایم کردن.
(٥) پتەوکردن؛ بەهێزترکردن؛ پاڵپشتی کردن:
*( He ~d his argument with new evidence.)*

**reinforced concrete,** کۆنکریتی شیش بەند.

**reinforcement** (rē´in-fôrs′mənt), *n.* (۱) بەهێزکردن؛ پتەوکردن؛
توندکردنەوە. (۲) شتی بەهێزکەر یا پاڵپشتیکەر.
(۳) ( *pl* ) ، سەربازو چەك و کەرەسەی جەنگی تازە نێرراو بۆ بنکەی سوپایی
یا مەیدانی جەنگ بۆ بەهێزکردنی ئەو لەشکرەی لەوێیە:
*( New ~s were sent to the front.)*

**reins** (rānz), *n.pl.* (۱) گورچیلە؛ کەلەکە؛ لاقەبرغە؛ لاخوارووی پشت و
کەلەکە. (۲) سەرچاوەی هەست ( کەوا بڕوا بوو کە لەکەلەکەدایە). (۳) هەست.

**reinstate** (rē´in-stāt′), *v.t.* دانانەوە لەسەر کار ( پاش دەرکردن)؛
وەرگرتنەوە لە قوتابخانە؛ گێڕانەوە بۆ سەر کار؛
خستنەوەکار یا گێڕانەوە (یاسا): *( to ~ a worker, student, etc.)* .

**reinstatement** (rē´in-stāt′mənt), *n.* دانانەوە لەسەر ئیش؛
وەرگرتنەوە لە قوتابخانە؛ گێڕانەوەی یاسا یا پەیڕەو.

**reinsure** (rē´in-shoor′), *v.t.* بیمەکردنەوە؛ سەرلەنوێ بیمەکردن.
**-reinsurance** *(n.)*.

**reinvest** (rē´in-vest′), *v.t.* سەرلەنوێ وەبەرهێنانی سەرمایەو
قازانجەکەی؛ دووبارە خستنە ئیشی سەرمایەو قازانج.
**-reinvestment** *(n.)*.

**reis** (rās), *n.* دراوی پورتوغالییە.

**reissue** (rē-ish′o͞o, rē-ish′ū), *v.t.* لە چاپ دانەوە؛
پوولی پۆستە دەرکردنەوە.
*n.* (۱) پەڕتووکی سەرلەنوێ لەچاپدراو.
(۲) پوولی پۆستەی سەرلەنوێ دەرکراو

**reiterate** (rē-it′ə-rāt´´), *v.t.* دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە:
*( He ~d the same statement he made yesterday.)*
**-reiteration** *(n.)*.

**reject** (ri-jekt′, rē′jekt), *v.t.* (۱) نەویستن؛ پەسەند نەکردن؛
ڕازی نەبوون؛ بەدڵ نەبوون: *( to ~ an offer )* .
(۲) فڕێدان. (۳) ڕشانەوە.
(٤) بەرهەڵستی کردن؛ مل نەدان؛ لە لووت دان.
*n.* شت یا کەسی نەویستراو؛ شتی فڕێدراو؛ شتی بەکارنەهاتوو؛
شتی پەسەند نەکراو.

**rejectamenta** (ri-jek´tə-men′tə), *n.pl.* (۱) شتی بێ کەڵك و
فڕێدراو؛ زبڵ. (۲) پیسایی؛ گوو.

**rejection** (ri-jek′shən), *n.* (۱) نەویستن؛ پەسەند نەکردن؛
ڕازی نەبوون؛ پەسەند نەکران. (۲) شتی پەسەند نەکراو یا نەویستراو

**rejoice** (ri-jois′), *v.i.* دڵخۆش بوون؛ دڵشاد بوون؛ زۆر پێ خۆش بوون؛
خۆشحاڵ بوون: *( We ~ in your success.)* .
*v.t.* دڵخۆش کردن؛ دڵشاد کردن.

**rejoicing** (ri-jois′iŋ), *n.* خۆشی؛ کامەرانی؛ شادی؛ دڵخۆشی.

**rejoin** (rē-join′), *v.t.* (۱) بەیەککەیشتنەوە؛ چوونەوە لا؛
یەکگرتنەوە یا بەیەککەیشتنەوە پاش جیابوونەوە: *( I will ~ you soon.)* .
(۲) یەك پێگرتنەوە.
*v.i.* یەکگرتنەوە پاش جیابوونەوە.

**rejoin** (ri-join′), *v.t.* وەڵام دانەوە؛ لە وەڵامدا وتن.
*v.i.* (۱) وەڵام دانەوە. (۲) وەڵام دانەوەی دادخواز ( دادگا).

**rejoinder** (ri-join′dēr), *n.* (۱) (ا) وەڵامی وەڵام. (ب) وەڵام.
(۲) وەڵامی داوا لەسەر بۆ داخواز ( دادگا).

**rejuvenate** (ri-jo͞o′və-nāt´), *v.t.* گەنج کردنەوە؛ بووژاندنەوە؛
هێزی لاوی پێدانەوە؛ تازەکردنەوە ( تین، ووزە، تاقەت)
**-rejuvenation** *(n.)*.

**rejuvenescence** (ri-jo͞o′və-nes´′ns), *n.* گەنج بوونەوە.

**rekindle** (ri-kin′d'l), *v.t. & v.i.* داگیرساندنەوە؛ هەڵگیرسانەوە؛
تازەبوونەوە: *( to ~ a fire; Our hopes ~d.)* .

**relapse** (ri-laps′), *v.i.* (۱) گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران.
(۲) نەخۆش کەوتنەوە پاش چاکبوونەوەیەکی کاتی؛ هەڵدانەوەی نەخۆشی؛
نەخۆش کەوتنەوە. (۳) گەڕانەوە بۆ سەر خوو ڕەووشتی خراپ؛ دانەدواوە؛
بە پاشدا هاتن.
*n.* (۱) گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران. (۲) هەڵدانەوەی نەخۆشی؛ نەخۆش کەوتنەوە.
(۳) دانەدواوە؛ گەڕانەوە بۆ ڕەووشت و خووی خراپ.

**relapsing fever,** تای گەڕاوە؛ تای پێنج بەڕۆ؛ تای سەرهەڵدەرەوە.

**relate** (ri-lāt′), *v.t.* (۱) گێڕانەوە ( چیرۆك)؛ ووتن.
(۲) پیشاندان یا بینینی پەیوەندی نێوان دوو شت:
*( to ~ theory and practice; to ~ what the government claims to what is actually happening)*
*v.i.* ( ~ to ). پەیوەندی لەگەڵدا بوون یا پەیداکردن؛ ڕەفتار لەگەڵ کردن؛
هەڵسان و دانیشتن لەگەڵدا؛ پەیوەندی پێوە بوون:
*( She can't ~ to people well.)*

**related** (ri-lāt′id), *adj.* (۱) گێڕراوە (چیرۆك)؛ ووتراو.
(۲) پەیوەندیدار؛ پەیوەندی پێوە هەیە. (۳) خزمایەتییان هەیە.

**relation** (ri-lā′shən), *n.* (۱) گێڕانەوە ( چیرۆك)؛ ووتن. (۲) چیرۆك.
(۳) پەیوەندی؛ پەیوەستی: *( the ~ of the individual to society; the ~ of theory and practice)*
(٤) خزمایەتی. (٥) خزم؛ کەس و کار.
(٦) ( *pl.* ) ، دۆستایەتی؛ پەیوەندی برادەرێتی:
*( His ~s with his friends are good.)*
(۷) ( *pl.* ) ، پەیوەندی نێو وولاتان: *( foreign and trade ~s)*
(۸) بەگوێرەی؛ بەپێی.
**in ( or with) relation to,** دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ لە بابەت.

**-relational** *(adj.)*.

**relashionship** (ri-lā′shən-ship′), *n.* (١) پەیوەندی؛ پەیوەستی.
(٢) خزمایەتی.

**relative** (rel′ə-tiv), *adj.* (١) پەیوەندیدار: پەیوەندی پێوەپە؛
دەربارەی؛ سەبارەت بە: ***( His letter was ~ to this matter.)*** .
(٢) هاوڕێژە: هاوپەیوەند: ***( We ended in the same ~ positions.)*** .
(٣) بەراووردی؛ دەکەوێتە سەر شتی تریش نەك هەر شتەکە خۆی؛ بەگوێرەی؛
بەستراوە بەشتی ترەوەو بە تەنها هەڵ ناسەنگێنرێ؛ لە چاو:
***( ~ wages; " strength" , " speed", "cold", and "heat" are ~ terms.; He accepted defeat with ~ calmness.)***
(٤) تایبەتی بە ووشەی لێکدەر ( ڕێزمان):
( وەك ووشەی " **which** " لەم نیمچە ڕستەیەدا):
***( the hat which you hought)***
***n.*** (١) ووشەی لێکدەر ( ڕێزمان). ( ژمارە چوار ببینە).
(٢) شتی هاوڕێژە: شتێکی هەڵسەنگێنراو لەچاو شتێکی تردا.
(٣) خزم: کەس وکار.

**relative to,** (١) دەربارەی؛ لەڕووی؛ سەبارەت بە.
(٢) لەچاو؛ ئەگەر بەراووردی بکەیت لەگەڵ شتێکی تردا.

**relatively** (rel′ə-tiv-li), *adv.* لەچاو شتی تردا؛
ئەگەر بەراووردی بکەیت لەگەڵ شتی تردا:
***( a ~ unimportant matter; He is ~ rich.)***

**relative clause,** نیمچە ڕستەی پەیوەندی: نیمچە ڕستەیەکە کە بە
ڕاناوی لێکدەر دەست پێ دەکات ( ڕێزمان):
( وەك " **who hesitates** " لەم ڕستەیەدا):
***( He who hesitates is lost.)***

**relative pronoun,** ڕاناوی لێکدەر ( ڕێزمان).
( وەك ڕاناوی " **who** " لەم ڕستەیەدا): ***( He who hesitates is lost.)*** .

**relativism** (rel′ə-tiv-iz'm), *n.* فەلسەفەی ڕێژەیی؛ بیروباوەڕێکە کە
دەڵێت ڕاستی و هەڵسەنگاندنی ڕاستییەکانی ژیان دەکەوێتە سەر مرۆ
خۆی و کات و شوێن و باری ژیانی؛ فەلسەفەی هاوپەیوەندی.

**relativist** (rel′ə-tiv-ist), *n.* (١) پەیڕەویکەری فەلسەفەی ڕێژەیی.
(٢) زانای بیردۆزەی ڕێژەیی ( فیزیا).

**relativity** (rel′ə-tiv′ə-ti), *n.* (١) هاوڕێژەیی: بەراووردی؛
هاوپەیوەندی دوو شت یا زیاتر لەگەڵ یەکتردا؛ ڕەچاوکردنی شتێك لەچاو
شتێکی تردا (٢) بیردۆزەی هاوڕێژەی ئەنیشتاین دەربارەی فیزیای گەردوون
(کە دەڵێت هەڵسەنگاندن و پێوانی هیچ شتێك بە تەنها ناکرێت بەڵکو بە
هاوپەیوەندی لەگەڵ یا لەچاو شتی تردا.)

**relator** (ri-lā′tēr), *n.* چیرۆکبێژ؛ چیرۆک گێڕەوە.

**relax** (ri-laks′), *v.t.* (١) شل کردن: ***( He ~ed his hold.)*** .
(٢) جڵەوشل کردن: خاوکردنەوە؛ نەرم کردن:
***( She ~ed her discipline of the child.)***
(٣) کەمکردنەوە؛ خاوبوونەوە (هەوڵ): ***( He ~ed his efforts.)*** .
(٤) پشوو پێدان؛ حەواندنەوە: ***( to ~ the mind, muscle, etc.)*** .
***v.i.*** (١) خاوبوونەوە ( ماسولکە)؛ شل بوون.
(٢) جڵەو شل بوون؛ زەبرو توندوتیژی کەم بوونەوە.
(٣) پاڵ لێدانەوە؛ پشت لێکردنەوە؛ ئارام گرتن؛ پشوودان:
***( He can't ~ because he has too many thing on his mind.)***

**relaxant** (ri-laks′ənt), *n.* دەرمانی خاوکردنەوەو کرژی نەهێشتنی
ماسولکە یا پشوودان بە مێشك.
***adj.*** پشووپێدەر ( دەرمان)؛ خاوکەرەوە.

**relaxation** (rē′lak-sā′shən), *n.* (١) خاوکردنەوە؛ خاوبوونەوە؛
کرژی نەمان ***( muscle ~ )*** .
(٢) جڵەو شل کردن؛ زەبرو توندوتیژی کەم بوونەوە؛ خاوکردنەوە:
***( a ~ of the rules)***
(٣) پشوودان: حەوانەوە.
(٤) ڕابواردن؛ کەیف و خۆشی: ***( I play tennis for ~ . )*** .

**relay** (rē′lā), *n.* (١) (ا) دەستە ئەسپی حەساوە بۆ نۆرە پێ کردن لەگەڵ
ئەسپی ماندوودا لە گەشتێکی چەند قۆناغیدا؛ نۆرە.
(ب) دەستە سەگی حەساوەی نۆرە پێ کراو لە ڕاو یا گالیسکەی بەفریندا.
(٢) دەستە کرێکاری ئامادە بۆ نۆرەکردن و پشوودان بەوانەی ماندوون؛
شەفتی کرێکار؛ نۆرە. (٣) ئامێری ووزە گوێزەرەوەو بەهێزکەر ( کارەبا،
مەکینەکاری). (٤) (ا) پێشبڕکێی بە نۆرە؛ دەست بەدەست گەیاندن ( پێشبڕکێ)
(ب) قۆناغێکی ئەم پێش بڕکێیە.
***v.t.*** (١) پێ گەیاندن ( پەیام، دەنگ وباس): ***( to ~ a massage)*** .
(٢) نۆرەکردن بە دەستە ئەسپ و سەگ و کرێکاری ماندو و جێ گرتنەوەیان
بە هی حەساوە. (٣) ووزە گواستنەوەو بەهێزکردن ( کارەبا، مەکینەکاری)

**relay** (rē′lā′), *v.t.* دانانەوە؛ سەرلەنوێ دانان.

**relay race,** پێشبڕکێی بە نۆرە: بریتییە لە پێشبڕکێیەکی چەند قۆناغی
کە ئەندامی تیپەکە هەریەکەیان لە قۆناغێکیدا ڕادەکەن.

**release** (ri-lēs′), *v.t.* (١) بەرەڵاکردن؛ بەردان؛ ئازادکردن:
***( to ~ a prisoner)***
(٢) هاویشتن ( تیر، بۆمبا)؛ فڕێدان.
(٣) ڕژاندن؛ لێ هێنانەدەرەوە ( شلە، هەوا، گاز).
(٤) بەخشین ( لە قەرزدانەوە، باج دان...هتد)؛ لێ خۆش بوون.
(٥) ئازادکردن ( لە ناخۆشی و گیروگرفت)؛ ئارام پێدان.
(٦) بڵاوکردنەوە (بەیاننامە، دەنگوباس): ***( to ~ a statement )*** .
(٧) دەست لێ هەڵگرتن و دان بە کەسێکی تر ( ماف، داوا).
***n.*** (١) بەردان؛ بەرەڵاکردن؛ ئازادکردن: ***( the ~ of prisoners)*** .
(٢) بەخشین ( لە باج یا قەرزدانەوە)؛ لێ خۆش بوون.
(٣) ئازادنامە؛ بەخشنامە. (٤) بەرەڵاکردن؛ بەردان.
(٥) ڕژان؛ ڕژاندن؛ لێ هاتنەدەرەوە ( شلە، گاز، هەوا).
(٦) ئامێری دەستپێکردن و کوژانەوەی مەکینە.
(٧) (ا) بڵاوکردنەوە ( پەڕتووك، فیلم، دەنگوباس...هتد).
(ب) شتی بڵاوکراوە ( پەڕتووك، فیلم، دەنگوباس...هتد).
(٨) (ا) دەست لێ هەڵگرتن بۆ کەسێکی تر ( ماف، داوا).
(ب) بەڵگەنامەی ئەم دەست لێ هەڵگرتنە.

**release** (rē′lēs′), *v.t.* بە کرێ دانەوە؛ بە کرێ گرتنەوە؛
سەرلەنوێ بە کرێ دان یا بە کرێ گرتن.

**relegate** (rel′ə-gāt′), *v.t.* (١) دەرکردن لە وڵات؛ دەرکردن؛
ئاوارەکردن؛ شاربەدەرکردن.
(٢) لە پلەو پایەیەکی نزمدا دانان؛ لە پلەی نزمدا فڕێدان.
(٣) پۆل پۆل کردن؛ بابەت بابەت کردن.
(٤) ئیش پێ سپاردن:
***( The director ~d the work to his assistant.; to ~ authority to a subordinate)***

**-relegation** *(n.)*.

**relent** (ri-lent′), *v.i.* (١) دڵ نەرم بوون؛ خاوبوونەوە؛ کۆڵ دان؛
دڵ داهێنان؛ لە توندوتیژی کەم بوونەوە. (٢) [Obs.]، تووانەوە.
*v.t.* [obs.]. دڵ نەرم کردن؛ خاوکردنەوە؛ دڵ پێ داهێنان.

**relentless** (ri-lent′lis), *adj.* (١) دڵڕەق؛ دڵ سەخت؛ توندوتیژ؛
دڵ نەرم بوونی بۆ نییە: ***( a ~ enemy)*** .
(٢) کۆڵنەدەر؛ بێ ووچان؛ بێ ئامان؛ هەرگیز نەوەستاو:
***( a ~ effort, storm, wind, etc.)***

**relevance** (rel′ə-vəns), *n.* پەیوەندی ( بە باسەوە):
***( What you say has no ~ to the subject.)***

**relevancy** (rel′ə-vən-si), *n.* = **relevance.**

**relevant** (rel′ə-vənt), *adj.* پەیوەندیدار ( بە باسەوە)؛
پەیوەندی پێوە هەیە: ***( This matter is not ~ to our discussion.)*** .

**reliability** (ri-lī′ə-bil′ə-ti), *n.* پشت پێ بەستران؛ پشت پێ بەستن.

**reliable** (ri-lī′ə-b'l), *adj.* پشت پێ بەستراو؛

پشتی پێ دەبەسترێ ( مرۆڤ، شت).
**reliably** (ri-līə-bli), *adv.* (١) بە جۆرێك كە پشتی پێ ببەسترێ.
(٢) بە رادەیەك كە پشتی پێ ببەسترێ؛ تا پلەیەكی پشت پێ بەستراو.
**reliance** (ri-lī′əns), *n.* (١) پشت پێ بەستن؛ بڕوا پێ بوون.
(٢) شتی پشت پێ بەستراو.
**reliant** (ri-lī′ənt), *adj.* (١) پشت پێ بەست؛ پشت پێ بەستوو.
(٢) پشت بە خۆ بەست.
**relic** (rel′ik), *n.* (١) كۆنینە؛ پاشماوەیەكی نەریت و شتی كۆن:
***( The death penalty is a ~ of the past.)***
(٢) نوشتە؛ موورفەڕك؛ پاشماوەی پیاوێكی ئاینی یا كەسێكی خۆبەختكەر
كە خەڵك بیپەرستێ و بە موورفەڕكی دانێ. (٣) یادگار.
(٤) (*pl* ) ، لاشەی مردوویەك.
**relict** (rel′ikt), *n.* (١) بێوەژن. (٢) گیاندارێك یا ڕووەكێكە كە هێشتا هەر
بژی هەرچەندە توخمەكەی قڕی تێكەوتووە.
***adj.*** (١) تایبەتی بە گیاندارێك یا ڕووەكێكی وەها كە هێشتا بەردەوام بێت
لەژیاندا. (٢) بێوەژن بوو؛ بێوەپیاو بوو.
**relief** (ri-lēf′), *n.* (١) دەروو؛ دەرفەت؛ چارە؛ ئاسوودەیی؛
بار سووك بوون. (٢) شتی ئاسوودەبەخش یا بار سووككەر.
(٣) یارمەتی (بەتایبەتی لە میرییەوە بۆ هەژارو لێقەوماوان).
(٤) هانا؛ فریاكەوتن؛ (بەتایبەتی هی خەڵكی لێ قەوماو، شارێكی ئابلۆقەدراو،
یا لەشكرێكی گەمارۆدراو)؛ یارمەتی.
(٥) (ا) پشوو پێدان یا نۆرە لەگەڵ كردنی كرێكار یا پاسەوانی ماندوو.
(ب) پشووپێدەر یا نۆرە لەگەڵ كەر.
(٦) (ا) نەخشی دەرپەڕیوی پەیكەرو دیوار ( پەیكەرتاشی، خانووسازی).
(ب) پەیكەری قۆرتاوی یا دەرپەڕیو. (٧) بەرزونزمی زەوی.
(٨) پەردەیەكی قۆشمەی شانۆنامە؛ بەشێكی پێكەنیناوی چیرۆكێك.
(٩) چاڵ‌وچۆڵی یا قۆرتی دەرپەڕیوی تابلۆ.
(١٠) بەرزونزمی یا چاڵ‌وچۆڵی ڕوویەك.
**in relief,** دەرپەڕیو ( خانووسازی)؛ چاڵ‌وچۆڵی تێدایە ( تابلۆ).
**on relief,** یارمەتی لە میرییەوە وەردەگرێت لەبەر هەژاری:
***( He is on relief.)***
**relief map,** نەخشەی بەرزو نزمی پیشاندەر وەك شاخ و دۆڵ و چەم و
ڕووبار
**relieve** (ri-lēv′), *v.t.* (١) بار سووك كردن؛ بار لە كۆڵ كردنەوە؛
سەر سووك كردن. (٢) (ا) لە ئێش و ئازارو ناخۆشی ڕزگاركردن:
***( to ~ his pain)***
(ب) چاككردنەوە؛ چارەكردن؛ تیماركردن.
(٣) یارمەتیدان؛ فریاكەوتن: ***( to ~ the poor ; to ~ a besieged city)*** .
(٤) (ا) بەخشین ( لە قەرز یا پێویستییەكی سەرشان)؛ لێ خۆش بوون.
(ب) بار لە كۆڵ كردنەوە؛ باری سەرشان لابردن.
(٥) نۆرە لەگەڵ كردنی كرێكار یا پاسەوانی ماندوو؛ پشوو پێدان:
***( She ~d the nurse.)***
(٦) لێ خستن؛ دەركردن؛ لابردن لەسەر كار.
(٧) لە ووشكی و ناخۆشی شتێك كەمكردنەوە.
(٨) مێزو گوو كردن: ***( to ~ oneself )*** .
**relievo** (ri-lē′vō), *n.* = **relief # 6.**
**religion** (ri-lij′ən), *n.* (١) ئاین.
(٢) شتێكە كە بووبێت بە ئاینی كەسێك ئەوەندە پەیڕەوی دەكات:
***( Cleanliness was a ~ to him.)***
**religionism** (rilij′ən-iz'm), *n.* (١) ئاین زۆر بە توندوتیژی گرتن؛
لە ڕادە بەدەر ئاین پەرستی. (٢) لە ئەندازە بەدەر بە ئاینی سەرزاری.
**-religionist** ***(n.).***
**religiose** (ri-lij′i-os´), *adj.* (١) زۆر بە ئاین؛ زۆر لەخواترس.
(٢) زۆر بە ئاین؛ بە سەرزاری.
**religiosity** (ri-lij´i-os′ə-ti), *n.* (١) لە ئەندازە بەدەر بە ئاینی.
(٢) زۆر بە ئاینی سەرزاری؛ خۆ زۆر بە ئایندار پیشاندان.
**religious** (ri-lij′əs), *adj.* (١) بە ئاین؛ ئایندار.
(٢) ئاینی؛ تایبەتی بە ئاین: ***( ~ books)*** .
(٣) تایبەتی بە كۆمەڵێكی لەخواترس یا ووشكەسۆفی؛
تایبەتی بە ئەندامی كۆمەڵێكی وەها.
(٤) زۆر بە ووردی پەیڕەوكەری شتێك: ***( He is ~ about cleanliness.)*** .
***n.*** ووشكەسۆفی؛ پیاو یا ژنی لە پەرستگا ژیاو.
**-religiously** ***(adv.)*****; religiousness** ***(n.).***
**relinquish** (ri-liŋ′kwish), *v.t.* (١) وازلێهێنان؛ بەجێهێشتن.
(٢) دەست لێ هەڵگرتن؛ دان بەدەستەوە:
***( We will not ~ any part of our country.; to ~ authority)***
(٣) دەست لێ بەرەڵاكردن؛ دەست شل كردن.
**-relinquishment** ***(n.).***
**reliquary** (rel´ə-kwĕr′i), *n.* نوشتەخانە؛ موورفەڕك خانە؛
سنووقێك یا ئارامگایەكە كە پاشماوەی پیاوێكی ئاینی تێدا هەڵدەگیرێ.
**relique** (rel′ik, ri-lēk′), *n.* [Archaic],= **relic.**
**reliquiae** (ri-lik′wi-ē´), *n.pl.* پاشماوەی بەردینی گیاندارو ڕووەك.
**relish** (rel′ish), *n.* (١) (ا) تام؛ چەژ. (ب) تامێكی تایبەتی.
(٢) نەختێك؛ تۆزێك. (٣) بۆن و بەرامە؛ تامێكی خۆش.
(٤) جۆش؛ تاس؛ بەدڵ: ***( He eats with ~ . )*** .
(٥) شتێكی خۆش.
(٦) ترشیات؛ بەهارات.
***v.t.*** (١) تام و بۆن و بەرامەی خۆش پێدان.
(٢) بەدڵ بوون؛ بە لاوە زۆر خۆش بوون؛ بە دڵەوە نووسان؛ حەزلێكردن.
***v.i.*** تامێكی خۆش دان؛ بۆن و بەرامە خۆش بوون.
**relucent** (ri-lōō′s'nt, ri-lū′s'nt), *adj.* بریقەدار؛ شەوقدەرەوە.
**reluct** (ri-lukt′), *v.i.* [Rare], دژ وەستان؛ بەرهەڵستی كردن؛
نابەدڵی پیشاندان.
**reluctance** (ri-luk′t'ns), *n.* (١) نابەدڵی؛ دوودڵی؛ بێ مەیلی؛
حەز پێ نەكردن؛ نەویستن. (٢) [Rare]، دژ وەستان؛ بەرگری.
(٣) بەرهەڵستی موگناتیسی.
**reluctancy** (ri-luk′t'n-si), *n.* = **reluctance.**
**reluctant** (ri-lukt'nt), *adj.* (١) نابەدڵ؛ حەز پێ نەكەر؛ نەویست؛
بێ مەیل: ***( He was ~ to help us.)*** .
(٢) بە نابەدڵییەوە كراو؛ بە خۆشی خۆ نەكراو: ***( a ~ answer)***
(٣) [Rare]، دژ وەستاو؛ دژ؛ بەرهەڵستیكەر.
**reluctantly** (ri-lukt'nt-li), *adv.* بە نابەدڵییەوە؛ بە ناحەزییەوە.
**reluctivity** (rel´ək-tiv′ə-ti), *n.* بەرهەڵستی موگناتیسی.
**relume** (rē-lōōm′, rē-lūm′), *v.t.* داگیرساندنەوە.
**rely** (ri-lī′), *v.i.* (١) پشت پێ بەستن؛ پێدا ڕاپەرموون.
(٢) ( ~ on; ~ upon ) ، بڕواپێكردن؛ پشت پێ بەستن.
**remain** (ri-mān′), *v.i.* (١) مانەوە؛ لێ مانەوە:
***( Nothing ~ed of the village.)***
(٢) مانەوە ( لە شوێنێك)؛ گل خواردنەوە: ***( He ~ed in the house.)*** .
(٣) بەردەوام بوون لەسەر: ***( He ~ed optimistic.)*** .
(٤) مانەوە؛ نەفەوتان؛ دەربردن: ***( The old house still ~s.)***
(٥) مانەوە ( ئیش‌وكار)؛ تەواو نەبوون: ***( Much ~s to be done.)***
**remainder** (ri-mān′dēr), *n.* (١) دوا ماوە؛ ماوە؛ پاشماوە؛ لێ ماوە:
***( He ate the ~ of the sandwich.)***
(٢) پەرتووكی بێ بازاڕی بە هەرزان فرۆشراو.
(٣) دوا ماوە ( ژمارەو پێوان)؛ ماوە.
***adj.*** ماوە؛ پاشماوە؛ دواماوە.
***v.i.*** پەرتووك و شتی بێ بازاڕ فرۆشتن بە هەرزان.
**remains** (ri-mānz′), *n.pl.* (١) دوا ماوە؛ پاشماوە؛ ماوە؛ پاشەڕۆك.
(٢) شوێنەوار؛ جێ نیشانە؛ نیشانە.

(٣) شتی لە کۆنەوە بەجێماو ( خانوو، پەیکەر...هتد).
(٤) لاشە؛ ئێسک و پرووسک.
(٥) نووسراوی بلاونەکراوەی لە دوا بەجێماوی نووسەرێکی مردوو.
(٦) نووسراوی لەدوا بەجێماوی نووسەرێکی کۆن.

**remake** (rē-māk′, rē′māk′), *v.t.* سەرلەنوێ درووستکردنەوە.
*n.* شتی سەرلەنوێ درووستکراو.

**reman** (rē-man′), *v.t.* (١) کرێکار یا سەربازی تازە بۆ ناردن.
(٢) غیرەت خستنەوە بەر؛ زات نانەوە بەر؛ وورە نانەوە بەر.

**remand** (ri-mand′), *v.t.* (١) ناردنەوە؛ گێرانەوە
(٢) (ا) ناردنەوەی بەندێك بۆ بەندیخانە ( بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی داواکارییەکەی).
(ب) ناردنەوەی داوایەك لە دادگایەکی بەرزەوە بۆ هی نزم ( بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی)
*n.* (١) (ا) ناردنەوە بۆ بەندیخانە؛ خستنەوە بەندیخانە.
(ب) ناردنەوەی داوایەك لە دادگای بەرزەوە بۆ هی نزم.
(٢) کەسێکی نێرراوە بۆ بەندیخانە.

**remanence** (ri-mān′əns), *n.* (١) مانەوە؛ نەفەوتان؛ دەربردن.
(٢) ماوە؛ دوا ماوە؛ پاشماوە. (٣) پاشماوەی تەوژمی موگناتیسی پاش لابردنی سەرچاوەی هێزە موگناتیسییەکە ( فیزیا).
**-remanent** *(adj.).*

**remark** (ri-märk′), *v.t.* (١) تێبینین؛ بینین؛ سەرنج دان.
(٢) تێبینی کردن؛ ووتن دەربارە؛ لێ دووان؛ ووتن.
(٣) [Obs.]، نیشانەکردن؛ جیاکردنەوە.
*v.i.* ( ~ on; ~ upon ), تێبینی کردن؛ ووتن دەربارە؛ را دەربڕین دەربارە: *( This point has often been ~ed upon.)*
*n.* (١) سەرنج؛ بینین؛ تێبینی: *( a place worthy of ~ )*.
(٢) تێبینی؛ ووتە؛ لێ دووان: *( to make a few ~s)*.
(٣) **remarque**.

**remarkable** (ri-mär′kə-b'l), *adj.* (١) شایانی باسە؛ سەیر.
(٢) سەرناسا؛ نایاب؛ نائاسایی *( a ~ person, event, etc.)*.
**-remarkableness** *(n.).*

**remarkably** (ri-mär′kə-bli), *adv.* بەشێوەیەك کە شایانی باسە یا سەرنج رادەکێشن؛ تارادەیەکی زۆر؛ بە شێوەیەکی نائاسایی؛ زۆر بە باشی.

**remarque** (ri-märk′), *n.* نیشانەی سەر قەراغی کلێشە ( چاپەمەنی).

**remediable** (ri-mē′di-ə-b'l), *adj.* چارەدار؛ چارە دەکرێ؛ دەرمان دەکرێ

**remedial** (ri-mē′di-əl), *adj.* (١) چارەکەر؛ دەرمانکەر؛ چاککەرەوە.
(٢) بۆ لابردن یا ڕاستکردنەوەی کەموکووڕییەکە ( بەتایبەتی هی خوێندن و نووسین) *( a ~ class in reading and writing)*.

**remediless** (rem′ə-di-lis), *adj.* بێ چارە؛ چارەی نییە؛ دەرمانی نییە

**remedy** (rem′ə-di), *n.* (١) دەرمان؛ چارە؛ چار.
(٢) چارەسەر؛ چارەکردن؛ چارە
(٣) ڕێگایەکی یاسایی بۆ سەندنەوەی مافێك یا چارەکردنی ناڕەوایییەك.
*v.t.* (١) چاککردنەوە؛ دەرمان کردن؛ چارەکردن.
(٢) چارەسەرکردن؛ ڕاستکردنەوە؛ چارەکردن؛ کەموکووڕی لابردن.

**remember** (ri-mem′bẽr), *v.t.* (١) هاتنەوە بیر؛ بیرکەوتنەوە: *( He tried to ~ her name.)*
(٢) لەبیربوون؛ لەیادبوون؛ لەبیر نەچوونەوە.
(٣) لەبەرچاو بوون ( چاکە).
(٤) (ا) بەسەرکردنەوە ( بۆ بەخشیش پێدان یا چاکە لەگەڵ کردن).
(ب) بەخشیش پێدان.
(٥) سلاولێکردن: *( ~ me to your father.)*.
(٦) [Obs.]، بیرخستنەوە؛ خستنەوە یاد
*v.i.* (١) لەبیربوون؛ لەیادبوون (٢) بیرکەوتنەوە.
(٣) بیر هەبوون؛ توانای بیرکردنەوە و لەبیربوون هەبوون.

**remembrance** (ri-mem′brəns), *n.* (١) لەبیربوون؛ لەیادبوون.
(٢) بیر؛ یاد؛ ماوەی لەبیرمان؛ ماوەی لەیادبوون.
(٣) یادکردنەوە؛ ئاهەنگی یادکردنەوە.
(٤) بیرەوەری. (٥) یادگار.
(٦) *(pl.)*، سلاو: *( to send ~s to someone)*.

**remembrancer** (ri-mem′brən-sẽr), *n.* (١) بیرخەرەوە.
(٢) [Rare]، کاربەدەستی قەرز کۆکەرەوە یا وەرگرەوە ( لە ئینگلتەرە).
(٣) یادگار.

**remex** (rē′meks), *n.* ( *pl.* **remiges** ), شاپەڕ.

**remind** (ri-mīnd′), *v.t. & v.i.* بیرخستنەوە؛ هێنانەوە بیر؛ خستنەوە یاد: *( She ~ed me of it.)*.

**reminder** (ri-mīn′dẽr), *n.* بیرخەرەوە؛ یادخەرەوە ( نامە، شت): *( She forgot her promise, so I sent her a ~ . )*

**remindful** (ri-mīnd′fəl), *adj.* (١) لەبیری نەچووە؛ لەیادێتی.
(٢) بیرخەرەوە؛ یادخەرەوە.

**reminisce** (rem′ə-nis′), *v.i.* (١) یادی کۆن کردنەوە؛ بیر لەشتی کۆن کردنەوە. (٢) لەسەر شتی کۆن نووسین یا دووان.

**reminiscence** (rem′ə-nis′'ns), *n.* (١) یادی شتی کۆن کردنەوە؛ بیر لەکاتی کۆن کردنەوە. (٢) یاد؛ بیر.
(٣) *(pl.)*، یادداشت؛ بیرەوەری؛ یادی کۆن.
(٤) بیرخەرەوە؛ یادخەرەوە؛ شتێکە کە یادی شتێکی ترت دەکاتەوە.

**reminiscent** (rem′ə-nis′'nt), *adj.* (١) بیر لە شتی کۆن کەرەوە؛ باسی شتی کۆن کەر بە تاسەوە: *( a ~ person)*.
(٢) بیری شت یا ڕووداوی کۆنت دەخاتەوە؛ لە ڕووداو یا کاتی ڕابوردوو دەچێت: *( a scene ~ of the idyllic life in his village)*

**remise** (ri-mīz′), *v.t.* دەست هەڵگرتن لە ماف ( دادگەری).

**remiss** (ri-mis′), *adj.* (١) کەمتەرخەم؛ گوێ پێ نەدەر؛ بە باشی پێ هەڵ نەساو: *( to be ~ in one's duties)*.
(٢) کەمتەرخەمی پیشان دەدات؛ نیشانەی نەزانی و گوێ پێ نەدانە
(٣) سست؛ تەمەڵ؛ خاو.
**-remissness** *(n.).*

**remissible** (ri-mis′ə-b'l), *adj.* دەبەخشرێت ( گوناه، تاوان)؛ لێ خۆش بوون یان لێبووردنی هەیە.

**remission** (ri-mish′ən), *n.* (١) لێبووردن ( گوناه، تاوان)؛ بەخشین: *( the ~ of sins)*
(٢) لێ خۆش بوون ( قەرز، باج، سزا)؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ وازلێهێنان.
(٣) کەم بوونەوە ( گەرمی، ساردی)؛ کزبوون.
(٤) سووك بوون؛ ( نەخۆشی، ئازار)؛ کەم بوونەوە ( توندوتیژی نەخۆشی)؛ کزبوون؛ وەستان: *( a ~ of his fever, cancer, etc.)*.

**remit** (ri-mit′), *v.t.* (١) لێ خۆش بوون ( گوناه)؛ بەخشین؛ لێبووردن: *( God will ~ sin.)*
(٢) (ا) لە قەرز خۆش بوون؛ باج لێ سەندن.
(ب) سزا لەسەر لابردن؛ لە سزا خۆش بوون.
(٣) کەمکردنەوە (هەوڵ)؛ خاوبوونەوە: *( He ~ted his efforts.)*.
(٤) گەڕاندنەوە بۆ دۆخی جاران؛ خستنەوە شوێنی خۆی؛ وەك خۆی لێ کردنەوە.
(٥) ناردنەوەی داواکارییەك بۆ دادگایەکی نزمتر بۆ زیاتر لێکۆڵینەوەی.
(٦) دانی مەسەلەیەك بە دەزگا یا کەسێکی شارەزا بۆ لێکۆڵینەوەی.
(٧) قەرزدانەوە؛ پارەدان؛ پارە ناردن: *( Please ~ this amount by the due date.)*
(٨) دواخستن ( بۆ لێکۆڵینەوەی تر).
(٩) [Rare]، ناردنەوەی بۆ بەندیخانە.
*v.i.* (١) کزبوون؛ کەم بوونەوە. (٢) دانەوە ( قەرز)؛ پارە پێدان؛ پێدان.
**-remitable** *(adj.)*; **remittor** *(n.).*

**remittal** (ri-mit′'l), *n.* = **remission.**

**remittance** (ri-mit′'ns), *n.* ١) پارە ناردن بە پۆستەدا؛ پارەدان؛ قەرزدانەوە. (٢) پارەی نێرراو؛ پارەی دراوە؛ قەرزی دراوە.

**remittance man,** کەسێکی لاوورگەیە کە لەدەرەوەی وولات دەژی بەو پارەیەی کە کەس‌وکاری بۆی دەنێرن.

**remittent** (ri-mit′'nt), *adj.* پچڕ پچڕ ( تا)؛ ناوبەناو؛ دەمدەمی: *( ~ fever)*

*n.* تای دەمدەمی؛ تای ناوبەناو.

**remitter** (ri-mit′ēr), *n.* ١) گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران.

٢) ناردنەوەی داواکاری‌یەك بۆ دادگایەکی نزم بۆ لێکۆڵینەوەی.

٣) خانووو زەوی‌وزار گرتنەدەست بەپێی تاپۆیەکی کۆنی درووست نەك تاپۆی تازەی نادرووست.

**remnant** (rem′nənt), *n.* (١) دواماوە؛ پاشماوە؛ ماوە؛ پاشمەڕۆك.

٢) ژمارەیەکی کەمی دواماوە: *( ~s of enemy troops)* .

٣) نیشانەی شتێکی کۆنی بە زۆری فەوتاو؛ پاشماوەی شتی کۆن؛ پاشماوەی ڕابوردوو: *( ~s of former glory)* .

٤) سەرەمەقەست.

**remodel** (rē-mod′'l), *v.t.* (١) داڕشتنەوە؛ سەرلەنوێ داڕشتن.

٢) تازەکردنەوە ( خانوو)؛ چاك کردن؛ دەست پیاهێنانی خانوو: *( He ~s houses for a living.)*

**remonstrance** (ri-mon′strəns), *n.* سکالا؛ ناڕەزایی؛ دژ وەستان؛ بێزاری.

**remonstrant** (ri-mon′strənt), *adj. & n.* ناڕەزایی دەربڕ؛ سکالاکەر؛ دژوەستاو؛ بێزاری دەربڕ.

**remonstrate** (ri-mon′strāt), *v.t.* (١) ناڕەزایی دەربڕین؛ بێزاری خۆ دەربڕین؛ سکالاکردن؛ دژ وەستان.

٢) [Obs.]، پیشاندان؛ خستنەڕوو.

*v.i.* ناڕەزایی خۆ دەربڕین؛ بێزاری دەربڕین؛ دژ وەستان.

**remonstration** (rē′mon-strā′shən), *n.* ناڕەزایی؛ سکالا؛ ناڕەزایی دەربڕین؛ بێزاری دەربڕین.

**remonstrative** (ri-mon′strə-tiv), *adj.* هی ناڕەزایی؛ هی بێزاری دەربڕین؛ سکالایی.

**remontant** (ri-mon′tənt), *adj.* وەرزی جارێك زیاتر دەپشکوێ ( وەك هەندێ گوڵ).

*n.* گوڵێکە کە وەرزی جارێك زیاتر دەپشکوێ.

**remora** (rem′ə-rə), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی بچووکە بەهۆی خەپلەیەکی مژۆکی سەر سەری‌یەوە خۆی دەنووسێنێ بە جلەو کەشتی‌و ماسی گەورەوە.

**remorse** (ri-môrs′), *n.* (١) پەشیمانی؛ کاڵەك بە ئەژنۆ شکان.

(٢) بەزەیی؛ هاوسۆزی؛ دڵنەرمی.

**remorseful** (ri-môrs′fəl), *adj.* پەشیمان.

**remorseless** (ri-môrs′lis), *adj.* دڵڕەق؛ بێ بەزەیی؛ ناپەشیمان.

**-remorselessly** *(adv.)*; **remorselessness** *(n.)*.

**remote** (ri-mōt′), *adj.* (١) دوور؛ دوورە دەست.

(٢) دوورو چەپەك؛ چەپەك؛ تەریك؛ پەڕ: *( a ~ village)* .

(٣) کۆن؛ دوور ( ڕابوردوو یا دوارۆژ): *( the ~ past)* .

(٤) دوور لە باسەوە؛ پەیوەندی کەمە بەباسەکەوە: *( a point ~ from the subject)*

(٥) دوور (خزم): *( a ~ cousin.)* .

(٦) دوورە پەرێز؛ گۆشەگیر: *( ~ and cold in his manner)* .

(٧) کەم: *( a ~ resemblance; a ~ possibility, chance, etc.)* .

(٨) ناسەرەکی؛ ناڕاستەوخۆ: *( the ~ causes of depression)* .

**-remotely** *(adv.)*; **remoteness** *(n.)*.

**remote control,** (١) دەستکاری کردن لە دوورەوە؛ بەڕێوەبردنی فڕۆکەو مووشەك‌و تەلەفزیۆن لە دوورەوە بەهۆی شەپۆل بێ تەلەوە.

(٢) ئامێری ئەم دەستکاری کردنە یا بەڕێوەبردنە.

**remotion** (ri-mō′shən), *n.* (١) لابردن؛ گواستنەوە.

(٢) [Obs.]، ڕۆیشتن؛ چوون.

**remount** (rē-mount′), *v.t. & v.i.* سواربوونەوە.

*n.* ئەسپی نۆرە پێ کراو لەگەڵ ئەسپی ماندوودا.

**removable** (ri-mo͞ov′ə-b'l), *adj.* لادەبرێت؛ دەتوانرێ بجووڵێنرێ؛ دەگوێزرێتەوە.

**-removability** *(n.)*.

**removal** (ri-mo͞ov′'l), *n.* (١) لابردن؛ لابران.

(٢) لێ خستن؛ دەرکردن لە ئیش یا سەرۆکایەتی؛ لابردن لە کاربەدەستی: *( the minister's ~ from office)*

(٣) (ا) گواستنەوە؛ جوڵان.

(ب) گوێزانەوە ( ماڵ)؛ گواستنەوە.

**remove** (ri-mo͞ov′), *v.t.* (١) لابردن؛ گواستنەوە؛ جوڵاندن.

(٢) داکەندن: *( ~ your coat.)* .

(٣) لێ خستن؛ لە ئیش دەرکردن؛ لە سەرۆکایەتی لابردن: *( to ~ from power)*

(٤) کوشتن.

(٥) نەهێشتن؛ لابردن؛ لەناوبردن: *( to ~ the causes of war)*

(٦) لێ لابردن؛ لێ جیاکردنەوە؛ لێکردنەوە: *( to ~ the dirt from)* .

*n.* (١) لابردن؛ جوڵان؛ گواستنەوە.

(٢) هەنگاو: *( We are but one short ~ from war.)* .

(٣) [British]، گواستنەوە ( ماڵ، خانوو)؛ گوێزانەوە.

**removed** (ri-mo͞ovd′), *adj.* (١) دوور ( پلەی خزمایەتی): *( My first cousin's child is my first cousin once ~ . )*

(٢) دوور؛ پەیوەندی کەمە یا نی‌یە؛ جیاواز.

**remover** (ri-mo͞ov′ēr), *n.* (١) لابەر؛ لێکەرەوە: *( a paint ~ )* .

(٢) گواستنەوەی داواکاری‌یەك لە دادگایەکەوە بۆ دادگایەکی تر.

**remunerate** (ri-mū′nə-rāt′), *v.t.* پاداشت دانەوە؛ خەڵات کردن: *( to ~ a person for his services)*

**-remunerative** *(adj.)*.

**remuneration** (ri-mū′nə-rā′shən), *n.* (١) پاداشت دانەوە؛ خەڵات کردن. (٢) پاداشت؛ خەڵات.

**renaissance** (ren′ə-säns′, ren′ə-zäns′), *n.* (١) بووژانەوە؛ لەدایکبوونەوە؛ بزووتنەوە؛ وووریابوونەوە؛ ڕاپەڕین.

(٢) [R-]،(ا) بزووتنەوەی هونەرو وێژەو زانیاری لە ئەورووپادا لە سەدانی چواردەو پانزەو شانزەدا؛ بزووتنەوەی ئەورووپا.

(ب) سەردەمی بزووتنەوە یا ڕاپەڕینی ئەورووپا.

(ج) شێوازی هونەرو وێژەو خانووسازی ئەم سەردەمە

(د) هەر جۆرە بزووتنەوە یا ڕاپەڕینێکی وەها.

*adj.* [R-], (١) تایبەتی بە شێوازی هونەرو وێژەی سەردەمی بزووتنەوە یا ڕاپەڕینی ئەورووپا: *( ~ painting; the ~ mind )* .

(٢) وەك شێوازی خانووسازی سەردەمی بزووتنەوەی ئەورووپا.

**renal** (rē′n'l), *adj.* گورچیلەیی؛ تایبەتی بە گورچیلەکان.

**renascence** (ri-nas′'ns), *n.* = **renaissance.**

**renascent** (ri-nas′'nt), *adj.* بووژاوە؛ گەشاوە؛ تازە لەدایکبووەوە.

**rencontre** (ren-kon′tēr), *n.* = **rencounter.**

**rencounter** (ren-koun′tēr), *v.t. & v.i.* (١) بەرەنگاری دوژمن بوون لە شەڕدا؛ ڕووبەڕوو وەستان. (٢) بەڕێکەوت تووش هاتن.

*n.* (١) تووش بوونێکی دوژمنانە؛ بەرەنگاربوون.

(٢) بە ڕێکەوت تووش بوونی برادەرێك.

**rend** (rend), *v.t.* (١) دڕاندن؛ پارچە پارچە کردن؛ پچڕاندن.

(٢) بە زۆر لێ سەندن؛ لە دەست هەڵپرووسکاندن؛ پڕپیاکردن‌و فڕاندن.

(٣) تێکدان؛ شێواندن: *( screams that ~ the silence)* .

(٤) پچڕاندن ( دڵ)؛ دڵ دەرهێنان؛ داخ‌و خەفەتی زۆر پێدان؛ شەق پێ بردن.

*v.i.* شەق بردن؛ دڕان؛ هەڵدڕین.

**render** (ren′dēr), *v.t.* (١) پێشکەش کردن ( بۆ پەسەندکردن،

لێکۆڵینەوە، داوای قەرز لێکردن)؛ دان ( ڕاپۆر):
***( ~ an account of your actions.; to ~ a bill)***
(٢) **(~ up)** ، دان بەدەستەوە؛ دەست لێ هەڵگرتن ؛ وازلێهێنان:
***( They ~ed up the town to the enemy.)***
(٣) دانەوە لەباتی ( چاکە، خراپە): ***( to ~ good for evil)*** .
(٤) دانەوە· پێدانەوە؛ بۆ گەڕاندنەوە: ***( I ~ back your gold.)*** .
(٥) دان؛ بۆ کردن؛ دانەوە لەباتی: ***( to ~ thanks, obedience, etc.)*** .
(٦) والێکردن:
***( The heat ~s me helpless.; It ~s the machine useless.)***
(٧) (ا) یارمەتیدان: ***( to ~ help)***
(ب) کردن ، کار، خزمەت)؛ پێشکەش کردن: ***( to ~ a service)*** .
(٨) نیشانە هەڵدان؛ پێشکەش کردن بە نووسین
(٩) نوواندن ( شانۆنامە)؛ بە دەنگی بەرز خوێندنەوە ( هەڵبەست، ووتار)؛
مۆسیقالێدان: ***( The actors ~ed "Hamlet" very well.)*** .
(١٠) گۆڕین؛ بە زمانێکی تر دەربڕین.
(١١) چەوری و پیو لێکردنەوە بە تواندنەوە.
(١٢) قیست دان یا قەرزدانەوە بە شێوەی پارە، شتوومەك، یا خزمەت.
(١٣) سواغ دان : چینی یەکەم).
***n.*** (١) قیست· خزمەت کردن یا شت پێدان لەباتی کرێ خانوو.
(٢) یەکەم سواغ· چینە سواغی یەکەم.
**rendezvous** (rän′də-vo͞o´), ***n.*** (١) جێگای بەیەکگەیشتن (لەسەر
بەڵێنێکی پێشوو)؛ شوێنی کۆبوونەوە؛ جێ ژووان.
(٢) شوێنی خەڵك کۆبوونەوە بۆ ڕابواردن، سەیران، یا وەرزش...هتد.
(٣) ژووان· یەکگرتن (بە نهێنی وەك دوو دڵدار، یا بە ئاشکرا)؛ کۆبوونەوە .
***v.i.*** کۆبوونەوە ( بەپێی بەڵێنێکی پێشوو)؛ یەکگرتن لە جێیەکی تایبەتیدا.
***v.t.*** کۆکردنەوە لە جێگەیەکی تایبەتیدا ( سەربان، کەشتی...هتد).
**rendition** (ren-dish′ən), ***n.*** (١) نوواندن ( شانۆنامە)؛ مۆسیقالێدان؛
پێشکەش کردن ( شانۆنامە، مۆسیقا)؛ شێوەی ئەم نوواندنە یا مۆسیقالێدانە:
***( the ~ of a dramatic role or a piece of music)***
(٢) گۆڕین ( زمانەوانی)؛ شێوەی گۆڕین لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر؛
ئەنجامی ئەم گۆڕینە.
(٣) [Archaic]، دان بە دەست دوژمنەوە؛ دەست هەڵگرتن.
**renegade** (ren′ə-gād´), ***n.*** (١) لە ئاینی خۆ هەڵگەڕاوە؛
کەسێکە کە واز لە ئاینی خۆی دێنێ بۆ ئاینێکی تر.
(٢) ناپاك؛ لە حیزب، گەل، یا ڕێبازی خۆ هەڵگەڕاوە.
**renegado** (ren´ə-gā′dō), ***n.*** = **renegade.**
**renege** (ri-nig′, ri-nēg′), ***v.i.*** (١) پەیمان شکاندن؛ پەشیمان بوونەوە
لە بەڵێنێك· لە پەیمان کشانەوە: ***( to ~ on a promise)*** .
(٢) پەیڕەو نەکردنی پەیڕەوی یاری ( یاری کاغەزو قومار).
***v.t.*** [Archaic], حاشاکردن
**-reneger** ***(n.).***
**renew** (ri-no͞o′, ri-nū′), ***v.t.*** (١) تازەکردنەوە؛ نوێ کردنەوە.
(٢) دەستپێکردنەوە؛ سەرلەنوێ کردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە.
(٣) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە؛ ووتنەوە:
***( ~ one's objection; ~ a promise)***
(٤) ئارزووقە یا تفاقی تازە خستن.
(٥) تازەکردنەوە ( قۆنتەرات): ***( to ~ a lease)***
***v.i.*** (١) تازەبوونەوە: نوێ بوونەوە. (٢) دەستپێکردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە.
**renewable** (ri-no͞o′āb'l, ri-nū′āb'l), ***adj.*** تازە دەبێتەوە؛
دێتەوە جێ ی (شتی بەکارهێنراو): ***( Electicity is a ~ energy.)*** .
**renewal** (ri-no͞o′əl, ri-nū′əl), ***n.*** (١) (ا) تازەکردنەوە؛
نوێ کردنەوە. (ب) تازەبوونەوە؛ نوێ بوونەوە:
***( a ~ of hope, determination, etc.)***
(٢) شتی تازەکراوە یا تازەبووەوە.
**reni-** (ren′i, rē′ni), *Also* **reno-** پێشگرێکە بەمانای: گورچیلە.

**reniform** (ren′i-fôrm´, rē′ni-fôrm´), ***adj.*** لە گورچیلە دەچێت.
**renin** (rē′nin), ***n.*** ئەنزیمێکە گورچیلە دەریدەدات دەبێتە هۆی
زیادبوونی پەستانی خوێن.
**renitent** (ri-nī′t'nt, ren′ə-t'nt), ***adj.*** (١) ڕەق؛ بەرهەڵستیکەر.
(٢) سەرسەخت؛ کەللەڕەق.
**-renitency** ***(n.).***
**rennet** (ren′it), ***n.*** (١) پەردەی چوارەم گەدەی گوێرەکە.
(٢) ماددەیەکە لەم پەردەیە دەردەهێنرێت بۆ شیر مەیاندن (لە پەنیر
درووستکردندا بەکاردێت). (٢) **rennin**.
**rennin** (ren′in), ***n.*** ئەنزیمێکە لە پەردەی چوارەم گەدەو ناوکی گوێرەکە
دەردەهێنرێت بۆ شیر مەیاندن.
**renounce** (ri-nouns′), ***v.t.*** (١) دەست لێ هەڵگرتن (ماف، ئاین،
حیزب، بیروباوەڕ)؛ وازلێهێنان:
***( to ~ one's citizenship, religion, party, right, etc.).***
(٢) حاشالێکردن: ***( He ~d his son.)*** .
(٣) واز لە خۆشی ژیان هێنان؛ کەنار گرتن: ***( to ~ the world)***
***v.i.*** دەست لە ماف هەڵگرتن.
**-renouncement** ***(n.)***; **renouncer** ***(n.).***
**renovate** (ren′ə-vāt´), ***v.t.*** (١) چاککردنەوە ( خانوو)؛ تازەکردنەوە:
***( to ~ a building)***
(٢) بووژاندنەوە؛ ژیاندنەوە.
**-renovator** ***(n.).***
**renovation** (ren´ə-vā′shən), ***n.*** چاککردنەوە (خانوو)؛
تازەکردنەوە.
**renown** (ri-noun′), ***n.*** (١) ناوبانگ؛ ناوداری؛ ناو.
(٢) [Obs.]، واتەوات.
***v.t.*** [Obs.], ناو پێ دەرکردن؛ ناودارکردن؛ ناوبانگ پێدان.
**renowned** (ri-nound′), ***adj.*** بەناوبانگ؛ ناسراو؛ بەناو؛ ناودار.
**rent** (rent), ***n.*** (١) کرێ؛ کرێ خانوو. (٢) بەروبوومی زەوی‌وزار؛ بەرهەم.
***v.t.*** (١) بە کرێ گرتن ( خانوو، زەوی، ئامێر).
(٢) **(~ out)** ، بە کرێ دان ( خانوو، زەوی، ئامێر).
***v.i.*** بە کرێ دان.
**for rent,** بۆ کرێ.
**rent** (rent), *past tense and past participle of* **rend.**
***adj.*** دڕاو؛ شەق بردوو؛ درز بردوو.
**rent** (rent), ***n.*** (١) کون (جلی دڕاو)؛ درزی زەوی.
(٢) دابەش بوون ( حیزب یا کۆمەڵ)؛ دووبەرەکی؛ جیابوونەوە.
**rental** (ren′t'l), ***n.*** (١) کرێ؛ کرێ خانوو. (٢) دەسکەوت (کرێ).
(٣) خانووی بەکرێ دراو؛ خانووی کرێ: ***( They have several ~s.)*** .
***adj.*** بۆ کرێ؛ هی کرێ: ***( a ~ property)*** .
**rente** (rä*n*t), ***n.*** [Fr.], (١) داهاتی ساڵانە؛ دەسکەوتی ساڵانە.
(٢) *(pl.)*، (ا) سەرجەمی قەرزی میری فەرەنسا. (ب) قازانجی ئەم قەرزە.
**renter** (ren′tēr), ***n.*** (١) کرێچی؛ کرێ گرتە.
(٢) بە کرێدەر؛ خاوەنی خانووی کرێ.
**rent-free** (rent′frē′), ***adj.*** بەبێ کرێ؛ بە خۆڕایی.
**renunciation** (ri-nun´shi-ā′shən), ***n.*** (١) دەست لێ هەڵگرتن
(ماف، ئاین، بیروباوەڕ، ڕێبان)؛ وازلێهێنان؛ حاشالێکردن:
***( ~ of pleasures, one's religion, rights, belief, etc.)***
(٢) بەیاننامەی دەست لێ هەڵگرتنێکی وەها.
**reopen** (rē-ō′p'n), ***v.t. & v.i.*** (١) سەرلەنوێ کردنەوە.
(٢) دەستپێکردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە.
**reorder** (rē-ôr′dēr), ***n.*** داوای دووبارە ( لە بازرگان یا دەڵاڵەوە بۆ
هەمان شت).
***v.t.*** (١) دووبارە داواکردن ( لە بازرگان یا دەڵاڵ بۆ هەمان شت).
(٢) ڕێك‌وپێك کردنەوە؛ سەرلەنوێ ڕێکخستن.

*v.i.* داواکردنی شتوومەك دووبارە.

**reorganization** (rē´ôr-gən-ī-zā′shən), *n.* (١) ڕێکخستنەوە؛ سەرلەنوێ ڕێك‌وپێك کردن. (٢) ڕێکخستنەوەی کۆمپانیایەك لەسەر بنچینەی تازە (بەتایبەتی باش نابووت بوون).

**reorganize** (rē-ôr′gə-nīz´), *v.t. & v.i.* ڕێکخستنەوە؛ سەرلەنوێ ڕێك‌وپێك کردن.

**reorient** (rē-ôr′i-ent´, rē-ō′ri-ent´), *v.t. & v.i.* ڕاهێنانەوە؛ پێ ڕاهاتنەوە؛ ڕاهاتنەوە.

**-reorientation** *(n.)*.

**rep** (rep), *n.* جۆرە قوماشێکی لۆکە، خوری، یا ئاوریشمی هێڵدارە.

**rep** (rep), *n.* [Colloq.], = **representative.**

**repackage** (ri-pak′ij), *v.t.* سەرلەنوێ پێچانەوە لە بەرگێکی تازەترو جوانتردا

**repaid** (ri-pād′), *past tense and past participle of* **repay.**

**repair** (ri-pâr′), *v.t.* (١) چاککردنەوە؛ چاك کردن: ***( to ~ a car, bicycle, window, etc. )***
(٢) بووژاندنەوە؛ چاك کردنەوە: ***( to ~ one's health)*** .
(٣) ڕاستکردنەوە؛ چاك کردن: ***( to ~ a mistake)*** .
(٤) بۆ بژاردن.
*n.* (١) چاك کردنەوە؛ چاك کردن
(٢) ( *pl* ) ، ئیش‌و کاری چاك کردنەوە؛ چاك کردنەوە: ***( The ~s on the house are not finished yet.)***
(٣) دۆخی شت لەڕووی چاك کردنەوە: ***( The house is in bad ~ .)*** .
**beyond repair,** چاری نی‌یە؛ بێ چارەیە؛ کار لەکار ترازاوە.

**repair** (ri-pâr′), *v.i.* (١) چوون: ***( to ~ to the parlor)*** .
(٢) زوو زوو بۆ چوون: ***( They ~ed daily to the park.)*** .
(٣) [Obs.]، گەڕانەوە.
*n.* (١) چوون؛ بۆ چوون بە گەشت. (٢) شوێنی زوو زوو سەرلێدراو.

**repairable** (ri-pâr′ə-b'l), *adj. Also* **reparable,** چار دەکرێت؛ چاك دەکرێتەوە.

**repairman** (ri-pâr′man´), *n.* چاککەرەوە؛ کەسێکە کە پیشەی چاك کردنەوەی شتی شکاوە.

**repand** (ri-pand′), *adj.* قەراغ شەپۆلی ( گەڵا ): ***( a ~ leaf)*** .

**reparable** (rep′ēr-ə-b'l), *adj.* = **repairable.**

**reparation** (rep´ə-rā′shən), *n.* (١) چاك کردنەوە؛ چاك کرانەوە.
(٢) بژاردن؛ قەرەبوو: ***( to make ~ for)*** .
(٣) ( *pl.* ) ، بژاردنی جەنگ ( کە وولاتی دۆڕاو بە وولاتی سەرکەوتووی دەدات): ***( war ~s)***

**reparative** (ri-par′ə-tiv), *adj.* (١) هی چاك کردن؛ چاك کردنەوەیی. (٢) تایبەتی بە بۆ بژاردن.

**repartee** (rep′ēr-tē´, rep′är-tē´), *n.* (١) وەڵامی قوت‌و نەستەق.
(٢) دەمەتەقێی قوت‌و نەستەق. (٣) بەهرەی وەڵامی قوت‌و خێرا دانەوە.

**repartition** (rē´pär-tish′ən, rē´pēr-tish′ən), *n.* (١) دابەش کردن؛ بەشکردن. (٢) سەرلەنوێ دابەشکردن؛ بەشکردنەوە.
*v.t.* دابەشکردنەوە؛ بەشکردنەوە.

**repass** (rē-pas′, rē-päs′), *v.t. & v.i.* بە لادا تێپەڕبوونەوە (بەتایبەتی لە گەڕانەوەدا)؛ تێپەڕبوون.

**repassage** (rē-pas′ij), *n.* (١) بە لادا تێپەڕبوونەوە؛ تێپەڕبوون.
(٢) گەڕانەوە؛ مافی گەڕانەوە یا تێپەڕبوون.

**repast** (ri-past′, ri-päst′), *n.* (١) (ا) ژەم. (ب) ژەمێك خواردەمەنی.
(٢) [Archaic]، (ا) نان خواردن. (ب) کاتی نان خواردن.
(٣) [Obs.]، خواردەمەنی؛ خواردن.

**repatriate** (rē-pā′tri-āt´), *v.t. & v.i.* ناردنەوە بۆ نیشتمانی خۆ ( دیلی جەنگ، پەنابەر): ***( Prisoners of war were ~d.)*** .
*n.* کەسێکی گەڕێنراوە بۆ وولاتی خۆی.

**repatriation** (rē-pā´tri-ā′shən), *n.* گەڕاندنەوە بۆ وولاتی خۆ ( دیلی جەنگ، پەنابەر).

**repay** (ri-pā′), *v.t.* (١) قەرزدانەوە. (٢) پاداشت دانەوە. (٣) بژاردن.
(٤) سەردانەوە: ***( to ~ a visit)*** .

**-repayable** *(adj.)*; **repayment** *(n.)*.

**repeal** (ri-pēl′), *v.t.* (١) هەڵوەشانەوە ( یاسا)؛ لابردن؛ سڕینەوە: ***( The law was ~ed.)***
(٢) [Obs.]، بانگ کردنەوە ( کەسێکی دەرکراو بۆ دەرەوەی وولات).
*n.* هەڵوەشاندنەوە؛ سڕینەوە؛ لابردن.

**repeat** (ri-pēt′), *v.t.* (١) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە: ***( to ~ a statement)***
(٢) لەبەر ووتن.
(٣) ووتنەوە؛ بۆ سەندنەوە: ***( He ~ed it after her.)*** .
(٤) پێ ووتن؛ درکاندن: ***( to ~ a secret)*** .
(٥) سەرلەنوێ کردنەوە: ***( to ~ an operation)*** .
(٦) قسە ووتنەوە: ***( He ~s himsself.)*** .
*v.i.* (١) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە.
(٢) ڕوودانەوە؛ دووبارەبوونەوە: ***( Experiences ~ .)*** .
*n.* (١) دووبارە ( کردن، ووتن)؛ دووبارەکردنەوە. (٢) شتی دووبارەکراوە
(٣) (ا) پارچەیەك مۆسیقای دووبارەکراوە.
(ب) نیشانەی ئەم دووبارەکردنەوەیە.

**repeated** (ri-pēt′id), *adj.* دووبارەکراوە؛ دووپاتکراوە.

**repeatedly** (ri-pēt′id-li), *adv.* جار لەدوای جار؛ گەلێك جار؛ جارەهای جار.

**repeater** (ri-pēt′ēr), *n.* (١) دووبارەکەرەوە (مرۆڤ، شت)؛ دووپاتکەرەوە. (٢) کاتژمێری سات لێدەر. (٣) **repeating firearm**.
(٤) دووبارە تاوانکار: تاوانکارێکە کە لەوەو پێش هەمان تاوانی کردووە یا لەهەمان بەندیخانەدا بووە.
(٥) دووبارە دەنگدەر لەهەمان هەڵبژاردندا بە ساختە.
(٦) قوتابی‌یەك کە وانەیەك وەردەگرێتەوە یا ساڵێك دووبارە دەکاتەوە لەبەر دەرنەچوون. (٧) **reepeating decimal**.

**repeating decimal,** کەرتی دەیی دووبارە یا سووڕاوە ( بیرکاری). (هەروەها پێشی دەووترێ: " **recurring decimal** " و " **circulating decimal** ").

**repeating firearm,** چەکی ئاگرینی دووبارەیی؛ تفەنگ یا دەمانچەیەکە کە چەند گوللەیەکی پێ دەتەقێنرێت بێ داگرتنەوە

**repel** (ri-pel′), *v.t.* (١) بەرهەڵستی کردن‌و گەڕاندنە دواوە؛ پاڵ پێوەنان بۆ دەرەوە؛ دەرکردن بەزۆر: ***( to ~ an attack, an aggressor, an invasion, etc.)***
(٢) نەویستن؛ پێ ڕازی نەبوون؛ پەسەند نەکردن: ***( to ~ an offer, a suitor, etc.)***
(٣) دوورخستنەوە؛ بەرهەڵستی کردن: ***( It ~s insects.)*** .
(٤) قێز لێ هاتنەوە؛ بوون بەهۆی بێزهاتنەوەو دوورکەوتنەوە: ***( The odor ~s me.)***
(٥) لێ دوورخستنەوە: ***( A plastic coating ~s moisture.)*** .
(٦) تێکەڵاو نەبوون: ***( water ~s oil)*** .
*v.i.* (١) بەرهەڵستی کردن‌و گەڕاندنە دواوە؛ دەرکردن.
(٢) بوون بەهۆی قێز لێ هاتنەوە.

**repellence** (ri-pel′əns), *n.* (١) بەرهەڵستی کردن‌و پاڵ پێوەنان بۆ دەرەوە؛ بە زۆر گەڕاندنە دواوە.
(٢) توانای ئەم بەرهەڵستی کردن‌و گەڕاندنە دواوەیە.

**repellency** (ri-pel′ən-si), *n.* = **repellence.**

**repellent** (ri-pel′ənt), *adj.* (١) بەرهەڵستیکەرو پاڵ پێوەنەر بۆ دەرەوە. (٢) بۆگەن؛ پیس. (٣) ئاوبڕ؛ ئاو کارتێنەکەر.
*n.* شتێکی بەرهەڵستیکەر: (ا) قوماشی ئاوبڕ یا ئاو کارتێنەکەر.

(ب) دەرمانی مێشوولەو مێش‌ومەگەز دوورخەرەوەیە (لە پێست دەدرێ).
(ج) دەرمانی ناوساوی‌و تلۆق.
**repent** (ri-pent′), *v.i.* (١) پەشیمان بوونەوە:
*( He ~ed of his severity)*
(٢) تۆبەکردن ( ئاین).
*v.t.* (١) تۆبەکردن ( ئاین)
(٢) پەشیمان بوونەوە: *( He ~ed his generosity.)*
**repent** (rē′pənt), *adj.* (١) خوەهەلواس ( ڕووەکناسی)؛ پێدا هەلگەڕاو.
(٢) خشۆك ( زیندەوەرزانی).
**repentance** (ri-pen′təns), *n.* (١) پەشیمانی؛ تۆبە:
*( He showed his ~ .)*
(٢) پەشیمان بوونەوە؛ تۆبەکردن.
**repentant** (ri-pen′tənt), *adj.* تۆبەکار؛ تۆبەکەر؛ پەشیمان.
**-repentantly** *(adv.).*
**repercussion** (rē′pēr-kush′ən), *n.* (١) گەڕانەوە؛ هەلبەزینەوە.
(٢) دەنگدانەوە. (٣) ئەنجامی ناڕاستەوخۆ ( بەتایبەتی هی ناپەسەند):
*( The explosion of the first atomic bomb had ~s all over the world.)*
**-repercussive** *(adj.).*
**repertoire** (rep′ēr-twär′, rep′ēr-twôr′), *n.* سەرجەمی ئەو شانۆنامەو دەورو گۆرانی‌یانەی تیپێکی شانۆگەری، نووانەرێك. گۆرانی بێژێك، یا مۆسیقاژەنێك هەمیشە ئامادەیە بۆ پێشکەش کردنی.
**repertory** (rep′ēr-tôr′i, rep′ēr-tō′ri), *n.* (١) عەمار ( بەتایبەتی هی شتی بەکەلك و نا خواردەمەنی) *( a ~ of useful information)* .
(٢) شتی ناو عەمارێکی وەها؛ شتی هەلگیراو.
(٣) repertoire.
**repertory theatre,** شانۆیەکە کە تیپێکی شانۆگەری هەمیشەیی سەروبەر شانۆنامەی تێدا پێشکەش دەکات.
**repetend** (rep′ə-tend′), *n.* (١) ژمارەی دووبارەبووەوەی کەرتی دەیی دووبارە یا سووڕاوە ( بیرکاری). (٢) دەنگی دووبارەکراوە ( مۆسیقا).
**repetition** (rep′ə-tish′ən), *n.* (١) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە؛ دووبارەکرانەوە؛ وتنەوە. (٢) لەبەر وتنەوە (هەلبەست).
(٣) وێنەی دەقاودەق.
**repetitious** (rep′ə-tish′əs), *adj.* دووبارەکراوە (بە جۆرێك کە ببێتە هۆی بێزاربوون یا بێ تاقەت بوون)؛ دووپاتکراوە.
**-repetitiously** *(adv.)*; **repetitiousness** *(n.).*
**repetitive** (ri-pet′ə-tiv), *adj.* دووبارەکراوە؛ دووپاتکراوە.
**-repetitively** *(adv.)*; **repetitiveness** *(n.).*
**rephrase** (rē-frāz′), *v.t.* دارشتنەوە ( ڕستە، وتە، وەلام، پرسیار؛ بە شێوەیەکی تر یا جیا دارشتنەوەو وتن:
*( to ~ a question, answer, statement, etc.)*
**repine** (ri-pīn′), *v.i.* ( ~ at ), سکالاکردن؛ بێزاری دەربڕین؛ ناڕەزایی دەربڕین
**replace** (ri-plās′), *v.t.* (١) خستنەوە شوێنی خۆی؛ لە شوێنی خۆی دانانەوە؛ گەڕاندنەوە بۆ دۆخی جاران.
(٢) جێ گرتنەوە؛ شوێن گرتنەوە یا پڕکردنەوە:
*( The automobile has ~d the horse.)*
(٣) گۆڕین: *( to ~ a worn tire)* .
(٤) گەڕاندنەوە؛ دانەوە: *( to ~ embezzled funds)* .
**replacement** (ri-plās′mənt), *n.* (١) جێ گرتنەوە؛ شوێن گرتنەوە یا پڕکردنەوە. (٢) جێ گرەوە؛ شوێن پڕکەرەوە؛ جێگر:
*( The director retired, but his ~ hasn't begun work yet.)*
(٣) سەربازی جێ گرەوە.
**replay** (ri-plā), *v.t.* لێدانەوە ( شریت. قەوان).
*n.* (١) لێدانەوە؛ لێدرانەوە. *( a ~ of the tape)* .
(٢) شتی لێدراوە.
**repleader** (rē-plēd′ēr), *n.* (١) دادخوازی دووبارە ( دادگەری).
(٢) مافی دادخوازی دووبارە. (٣) فەرمانی دادگا بە دووبارە دادپرسینەوە.
**replenish** (ri-plen′ish), *v.t.* (١) پڕکردنەوە ( بە ئازووقەی تازە)؛ شتی تازە بۆ هێنان لەباتی ئەوەی بەکارهێنراوە:
*( to ~ the stock of goods)*
(٢) سووتەمەنی تازە بۆهێنان؛ سووتەمەنی تازە تێخستن.
**-replenishment** *(n.).*
**replete** (ri-plēt′), *adj.* (١) پڕ:
*( a home ~ with every comfort; History is ~ with examples of injustice.)*
(٢) تێر؛ ئێجگار تێر.
**-repleteness** *(n.).*
**repletion** (ri-plē′shən), *n.* (١) پڕی؛ پڕێتی.
(٢) تێری: *( He ate to ~ . )* .
**replevin** (ri-plev′in), *n.* (١) گەڕانەوەی شتوومەکی بە ناڕەوایی سەنراو بۆ خاوەنەکەی. (٢) فەرمانی دادگا دەربارەی ئەم گەڕاندنەوەیە.
*v.t.* گەڕاندنەوەی شتوومەکی بە ناڕەوایی دەستبەسەرداگیراو بۆ خاوەنەکەی.
**replevy** (ri-plev′i), *n.* = **replevin.**
**replica** (rep′li-kə), *n.* (١) وێنەی دەقاودەقی بەرهەمێکی هونەری وەك پەیکەر یا تابلۆ بەتایبەتی بە دەستی هونەرمەندەکە خۆی.
(٢) وێنەی دەقاودەق.
**replicate** (rep′li-kit, rep′li-kāt′), *adj.* نوشتاوە بە پشتدا ( وەك گەلا).
*v.t.* (١) نوشتاندنەوە بە پشتدا.
(٢) وێنەی دەقاودەق لەسەر دەرهێنان؛ وێنە لەبەرگرتنەوە؛ دووبارەکردنەوە.
(٣) [Rare]، وەلام دانەوە.
**replication** (rep′li-kā′shən), *n.* (١) نوشتانەوە بە پشتدا؛ توێ.
(٢) وەلام؛ وەلام دانەوە. (٣) وەلامی دادخواز بۆ گومانبار (دادگەری).
(٤) دەنگدانەوە. (٥) وێنەی دەقاودەق؛ وێنە. (٦) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان
**reply** (ri-plī′), *v.i.* (١) وەلام دانەوە.
(٢) تەقەلێکردنەوە یا پەلاماردانەوەی دوژمن:
*( They ~ied to the enemy's fire.)*
(٣) دەنگدانەوە. (٤) وەلام دانەوەی گومانبار ( دادگەری).
*v.t.* وەلام دانەوە؛ لە وەلامدا وتن.
*n.* (١) وەلام؛ وەلام دانەوە. (٢) کردارێکە کە وەلامی کردارێکی پێشترە.
(٣) وەلامی بەرپەرچدانەوەی دادخواز بۆ گومانبار ( دادگەری).
**-replier** *(n.).*
**report** (ri-pôrt′, ri-pōrt′), *n.* (١) ڕاپۆرت دان؛ وتن.
(٢) ڕاپۆرت نووسین ( ڕۆژنامەگەری). (٣) بلاوکردنەوە.
(٤) سکالاکردن دەربارە؛ دەنگوباس گەیاندن بە کاربەدەستان؛ ڕاپۆرت لەسەر یا لە دژ نووسین:
*( to ~ an accident, a burglary, etc.)*
*v.i.* (١) ڕاپۆرت نووسین؛ ڕاپۆرت ئامادەکردن.
(٢) ڕۆژنامەگەری کردن.
(٣) هاتن بۆ ئیش؛ چوون بۆ کارکردن: *( to ~ for duty)* .
*n.* (١) واتەوات؛ قاو: *( ~ has it that you are married.)* .
(٢) ناوبانگ؛ ناو: *( a man of good ~ )* .
(٣) ڕاپۆر؛ ڕاپۆرت؛ دەنگوباس: *( a ~ of a battle.)* .
(٤) ڕاپۆری ڕەسمی؛ ڕاپۆرت.
(٥) *(pl.)* ، تۆمارنامەی داواکاری‌و بڕیاری دادگا.
(٦) تەقە؛ دەنگ؛ دەنگی تەقینەوە: *( the ~ of a gun)* .
**-reportable** *(adj.).*
**reportage** (ri-pôrt′ij, ri-pōrt′ij), *n.* ڕیپۆرتاج: تێڕوانینێکی ڕۆژنامەگەری.

**report card,** ڕاپۆری قوتابخانە؛ ڕاپۆرتێکە دەربارەی نمرەو ڕەووشتی قوتابی کە قوتابخانەکەی سالی چەند جارێك دەینێرێ بۆ دایك و باوکی.

**reportedly** (ri-pôr′tid-li), *adv.* گوایە؛ وەك دەڵێن؛ دەڵێن.

**reporter** (ri-pôr′tēr, ri-pōr′tēr), *n.* (١) تۆمارکەری کۆڕی دادگاو پەرلەمان *( a court ~ )*.
(٢) ڕاپۆرنووسی ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن؛ پەیامنێری ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆن: *( a newspaper ~ ; a news ~ )*.

**-reportorial** *(adj.).*

**repose** (ri-pōz′), *v.t.* پاڵخستن؛ پاڵکەوتن؛ حەوانەوە:
*( ~ yourself on the bed.)*
*v.i.* (١) پاڵکەوتن؛ ڕاکشان. (٢) حەوانەوە؛ حەسانەوە؛ پشوودان.
(٣) حەوانەوە یا ڕاکشان لە گۆڕدا:
*( He ~s at the Saiwan cemetery.)*
(٤) (~ in) ، پشت پێ بەستن.
(٥) بە بێ دەنگی مانەوە یا درێژبوونەوە: *( The land ~s in the dusk.)*.
(٦) پاڵ پێوەدان: کەوتنە سەر؛ لەسەر وەستان.
*n.* (١) پاڵکەوتن؛ ڕاکشان. (٢) (ا) حەوانەوە؛ حەسانەوە. (ب) نوستن.
(٣) ئاسوودەیی (٤) هێمنی؛ لەسەرخۆیی.
(٥) کپی؛ بێ دەنگی؛ کش‌وماتی؛ ئاسایش؛ ئاشتی؛ خامۆشی.
(٦) یەك تەوایی؛ یەك دانی؛ پێکەوە گونجان.

**repose** (ri-pōz′), *v.t.* (١) دانان.
(٢) (~ in) ، بڕواپێکردن.

**reposeful** (ri-pōz′fəl), *adj.* هێمن؛ بێدەنگ؛ خامۆش.

**reposit** (ri-pōz′it), *v.t.* (١) هەڵگرتن؛ عەمارکردن؛ دانان بۆ دواڕۆژ.
(٢) [Rare]، خستنەوە شوێنی خۆی؛ گەڕاندنەوە بۆ جێی خۆی.

**-reposition** *(n.).*

**repository** (ri-poz′ə-tôr′i, ri-poz′ə-tō′ri), *n.* (١) سندووق؛ چەکمەجە؛ دۆلاب؛ شوێنی شت هەڵگرتن.
(٢) [Rare]، مۆزەخانە.
(٣) عەمبار؛ دوکان؛ کۆگا. (٤) گۆڕ.
(٥) عەمبار؛ مەجان؛ سەرچاوە:
*( The old professor was a ~ of knowledge.)*
(٦) ڕازگر؛ ڕازپۆش

**repossess** (rē′pə-zes′), *v.t.* (١) دەستبەسەرداگرتنەوە:
*( The bank ~ed his house.)*
(٢) بۆ گەڕاندنەوە؛ پێدانەوەی شتی خۆ:
*( They ~ed him of his house.)*

**-repossession** *(n.).*

**repoussé** (rə-pōō′sā′), *adj.* [Fr.], (١) نەخش و کلێشەی دەرپۆقیو (کانزاکاری) (٢) بە نەخش و کلێشەی دەرپۆقیو و ڕازاوە.
*n.* نەخش و کلێشەی دەرپۆقیو.

**reprehend** (rep′ri-hend′), *v.t.* (١) سەرزەنشتکردن.
(٢) ڕەخنەلێگرتن؛ لۆمەکردن.

**reprehensible** (rep′ri-hen′sə-b'l), *adj.* شایستەی سەرزەنشتکردنە؛ ناشرین؛ خراپ؛ ناپەسەند؛ پیس (کردەوە، ڕەوشت):
*( a ~ act)*

**-reprehensibility** *(n.)*; **reprehensibly** *(adv.).*

**reprehension** (rep′ri-hen′shən), *n.* سەرزەنشتی؛ سەرزەنشتکردن

**reprehensive** (rep′ri-hen′siv), *adj.* هی سەرزەنشتی؛ تایبەتی بە سەرزەنشتی کردن.

**represent** (rep′ri-zent′), *v.t.* (١) پیشاندان؛ ڕوونکردنەوە؛ هێنانە بەرچاو. (٢) باس کردن؛ نیشانە هەڵدان.
(٣) نیشانەی ئەوە بوون؛ واگەیاندن؛ دەربڕین.
(٤) بریتی بوون لە: *( A cave ~ed home to these people.)*.
(٥) نوواندن (شانۆنامە)؛ پێشکەش کردن.
(٦) نوێنەری کردن (دادگەری)؛ بریکاری کردن:
*( A lawyer ~ed each side.)*
(٧) نوێنەری کردن (لە پەرلەماندا یا وولاتێکی تردا وەك باڵیۆز)؛ نوێنەربوون:
*( He ~s his district well in paliament.)*
(٨) نموونە بوون بۆ؛ بوون بە نموونە بۆ.

**-representable** *(adj.).*

**representation** (rep′ri-zen-tā′shən), *n.* (١) پیشاندان؛ ڕوونکردنەوەیەك. (٢) وێنە.
(٣) بەیان؛ بەیاننامە. (٤) نموونەکاری.
(٥) نوێنەری: *( They have no ~ in the parliament.)*
(٦) نوێنەران (پەرلەمانی و دبلۆماسی).
(٧) نوواندن (شانۆنامە)؛ پێشکەش کردن لەسەر شانۆ.

**-representational** *(adj.).*

**representative** (rep′ri-zen′tə-tiv), *adj.* (١) هی پیشاندان یا ڕوونکردنەوە. (٢) هی نوێنەری کردن.
(٣) نوێنەری: *( a ~ assembly)*.
(٤) دەستووری؛ نوێنەری: *( a ~ government)*
(٥) نموونەیی: *( NewYork is not a ~ American city.)*
*n.* (١) نموونە. (٢) نوێنەر (پەرلەمانی یا دبلۆماسی).
(٣) [R-]، ئەندامی کۆنگرێس "ئەنجوومەنی نوێنەران" ی ئەمەریکی یا پەرلەمانی یەکێك لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

**repress** (ri-pres′), *v.t.* (١) ڕێ لێگرتن؛ بەربەستکردن؛ نەهێشتن؛ خۆڕاگرتن: *( to ~ a laugh)*.
(٢) کوژاندنەوە؛ دامرکاندنەوە: *( to ~ a rebellion)*.
(٣) (ا) پێشێل کردن؛ پێپەست کردن؛ پەستنەوە؛ پەستکردن:
*( to ~ a people's hopes)*
(ب) چەوساندنەوە.
(٤) کردن بەژێرەوە (هەست و یادی ناخۆش)؛ شاردنەوە (هەست): پێپەست کردن؛ ئاشکرا نەکردن.

**-repressible** *(adj.).*

**repressed** (ri-prest′), *adj.* پێشێل کراو؛ پێپەست کراو؛ شاراوە (هەست)؛ بە ژێرەوە کراو؛ پەستراوە.

**repression** (ri-presh′ən), *n.* (١) پێشێل کردن؛ پێپەست کردن.
(٢) چەوساندنەوە؛ زۆرداری؛ زەبروزەنگ.
(٣) شاردنەوە (هەست)؛ کردن بە ژێرەوە (هەست و ئارەزووی نابەجێ)

**repressive** (ri-pres′iv), *adj.* پێشێلکەر؛ پێپەستکەر؛ چەوسێنەرەوە؛ زۆردارانە:
*( ~ measures taken by the government)*

**-repressiveness** *(n.).*

**reprieve** (ri-prēv′), *v.t.* (١) وەستاندن یا دواخستنی سزا (بەتایبەتی هی هەڵواسینی تاوانکارێك). (٢) ڕزگارکردن لە ناخۆشییەك؛ دواخستنی کارەساتێك.
*n.* (١) (ا) سزای هەڵواسینی تاوانکارێك دواخستن یا وەستاندن.
(ب) فەرمانی ئەم دواخستن یا وەستانە.
(٢) ڕزگاری سەردەمی لە ناخۆشی یا کارەسات؛ مۆڵەت؛ پشوو:
*( They got a temporary ~ from bombing.)*

**reprimand** (rep′rə-mand′), *n.* سەرزەنشی؛ پیاهەڵشاخان.
*v.t.* سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخان.

**reprint** (rē-print′), *v.t.* لە چاپ دانەوە (بەبێ گۆڕین یا دەستکاری).
*n.* (١) (ا) چاپی دووەمی پەرتووك یا گۆڤار (بەبێ گۆڕین).
(ب) ووتارێك یا بەشێکی لە گۆڤارو پەرتووك وەرگیراوو بەجیا لەچاپدراو.
(٢) پوولی پۆستەی دەکراو لەسەر پوولێکی کۆن هەر بۆ هەڵگرتن نەك بەکارهێنان.
(٣) لەچاپ دانەوە.

**reprisal** (ri-prī′z'l), *n.* (١) داگیرکردنی خاکی دوژمن بە خەڵکەکەیەوە

بۆ تۆڵەسەندن. (٢) تۆڵە؛ تۆڵەسەندن؛ تۆڵەکردنەوە.

**reprise** (ri-prīz′, rə-prēz′), *n.* دووبارەکردنەوە ( مۆسیقا)؛
گەڕانەوە بۆ سەرەتای پارچەیەك مۆسیقا.

**reproach** (ri-prōch′), *v.t.* (١) سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخان.
(٢) گلەیی کردن (٣) شەرمەزاری بەسەردا هێنان.
*n.* (١) شەرمەزاری؛ سەرشۆڕی. (٢) سەرزەنشتی؛ پیاهەڵشاخان.

**reproachful** (ri-prōch′fəl), *adj.* (١) پڕە لەسەرزەنشتی؛
لە سەرزەنشتی یا پیاهەڵشاخان دەچێت: ***( a ~ tone of voice)*** .
(٢) [Obs.]، جێی شەرمەزارییە؛ بافتی سەرزەنشتکردنە.
**-reproachfully (adv.); reproachfulness (n.).**

**reproachless** (ri-prōch′lis), *adj.* گلەیی لەسەر نییە؛
خراپەی نەکردووە؛ شایانی سەرزەنشتی نییە

**reprobate** (rep′rə-bāt′), *adj.* (١) بێ ناموس؛ نزم؛ بەدڕەفتار؛
ناپەسەند (٢) ئاخر شەڕ؛ خوانەناس؛ خواگرتوو.
*n.* کەسێکی بێ ناموس و بەدڕەفتار.
*v.t.* (١) نارەزایی دەربڕین دەربارەی؛ بێزاری دەربڕین دەربارەی؛ دژ وەستان.
(٢) نەویستن.
**-reprobation *(n.)*.**

**reproduce** (rē′prə-do͞os′, rē′prə-dūs′), *v.t.* (١) سەرلەنوێ
هێنانە بەرهەم؛ هێنانەوە بەرهەم. (٢) منداڵبوون؛ بەچکەکردن؛ زاوزێ کردن.
(٣) بووژاندنەوە ( ئەندامی فەوتاوی لەش)؛ زیندووکردنەوە.
(٤) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان؛ وێنە لەسەر دەرکردن.
(٥) هێنانەوە بەرچاو. (٦) دووبارەکردنەوە؛ دووپاتکردنەوە.
(٧) پێشکەش کردنەوە لەسەر شانۆ؛ نواندنەوە
*v.i.* (١) منداڵبوون؛ بەچکەکردن؛ زاوزێ کردن؛ سکوزا کردن:
***( Rabbits ~ faster than other animals.)***
(٢) وێنەی دەقاودەق لەسەر دەرهێنران؛ وێنە لەسەر دەرکران.
**-reproducer *(n.)*; reproducible *(adj.)*.**

**reproduction** (rē′prə-duk′shən), *n.* (١) هێنانەوە بەرهەم.
(٢) وێنەی دەقاودەق؛ وێنە. (٣) زاوزێ؛ زاوزێ کردن؛ بەچکەکردن؛ سکوزا.

**reproductive** (rē′prə-duk′tiv), *adj.* (١) دروستکەرەوە؛
تازەکەرەوە؛ بە بەرهەم هێنەرەوە.
(٢) هی منداڵبوون؛ هی زاوزێ: ***( ~ organs)*** .
**-reproductively (adv.); reproductiveness (n.).**

**reproof** (ri-pro͞of′), *n.* (١) سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخان.
(٢) سەرزەنشتی؛ پیاهەڵشاخین

**reprovable** (ri-pro͞ov′ə-b'l), *adj.* بافتی سەرزەنشتکردنە؛
شایانی سەرزەنشتییە.

**reproval** (ri-pro͞ov′'l), *n.* = **reproof.**

**reprove** (ri-pro͞ov′), *v.t.* (١) سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخان.
(٢) ڕەخنەلێگرتن. (٣)[.Obs]، بەرپەرچدانەوە؛ بەدرۆخستنەوە.
(٤) [.Obs]، پێ سەلماندن.

**reptant** (rep′tənt), *adj.* پیاهەڵگەڕاو ( ڕووەك)؛ خشۆك ( گیاندار).

**reptile** (rep′til, rep′tīl), *n.* (١) گیانداری خشۆك (کە مارومارمێلکەو
تیمساح و کیسەڵ دەگرێتەوە)؛ خشۆك؛ خشندە.
(٢) کەسێکی نزم و پیس و بۆگەن.
*adj.* (١) خشۆك؛ خشندە. (٢) تایبەتی بە گیاندارە خشۆکەکان.
(٣) پیس و بۆگەن؛ نزم ( مرۆڤ، کردەوە)؛ نهێنکر ( مرۆڤ).

**reptilian** (rep-til′i-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە گیاندارە خشۆکەکان؛
هی خشندەکان (٢) خشۆك؛ خشندە.
(٣) نزم؛ پیس و بۆگەن؛ بەدخوا؛ نهێنکر (مرۆڤ).
*n.* گیانداری خشۆك.

**republic** (ri-pub′lik), *n.* (١) کۆمار
(٢) وڵاتی کۆماری؛ وڵاتێکە کە ڕژێمی کۆماری هەبێ.

**republican** (ri-pub′li-kən), *adj.* (١) کۆماری؛ تایبەتی بە ڕژێمی
کۆماری. (٢) کۆمارخواز؛ سەر بە ڕژێمی کۆماری.
(٣) [-R]، تایبەتی بە حیزبی کۆماری ئەمەریکا.
*n.* (١) کەسێکی کۆمارخواز؛ کەسێکی سەر بە ڕژێمی کۆماری.
(٢) [-R]، ئەندامی حیزبی کۆماری ئەمەریکا.

**republicanism** (ri-pub′li-kən-iz'm), *n.* (١) ڕژێمی کۆماری؛
کۆمارێتی. (٢) بیروباوەڕو فەلسەفەی ڕژێمی کۆماری.
(٣) پەیڕەوکردنی ئەم بیروباوەڕو فەلسەفەیە.
(٤) [-R]، بیروباوەڕو فەلسەفەو ڕێبازی ڕامیاری حیزبی کۆماری ئەمەریکا.

**republicanize** (ri-pub′li-kən-iz′), *v.t.* ڕژێمی کۆماری
دامەزراندن؛ ڕاکێشان بۆ بیروباوەڕو فەلسەفەو ڕێبازی کۆماری؛
کردن بە کۆماری.

**republication** (rē′pub-li-kā′shən), *n.* (١) سەرلەنوێ
بڵاوکردنەوە. (٢) پەڕتووك یا گۆڤاری دووبارە بڵاوکراوە.

**republic of letters,** (١) نووسەران؛ بوێژان. (٢) وێژە.

**repudiate** (ri-pū′di-āt), *v.t.* (١) حاشالێکردن؛
پەیوەندی پچڕان لەگەڵدا:
***( to ~ one's son, wife, former friends, etc.)***
(٢) وازلێهێنان ( بیروباوەڕ)، حاشالێکردن:
***( to ~ one's former beliefs)***
(٣) دان پیانەنان ( قەرز)؛ حاشالێکردن؛ نەدانەوە: ***( to ~ a debt)*** .
**-repudiator *(n.)*.**

**repudiation** (ri-pū′di-ā′shən), *n.* (١) حاشالێکردن؛
پەیوەندی پێوە نەهێشتن. (٢) دان پیانەنان ( قەرز)؛ حاشالێکردن؛ نەدانەوە.

**repugn** (ri-pūn′), *v.t. & v.i.* [Rare or Obs.], بەرهەڵستی کردن؛
بەربەرەکانی کردن.

**repugnance** (ri-pug′nəns), *n.* (١) نەگونجان لەگەڵ یەك.
(٢) قین؛ ڕق؛ زۆر ڕق لێ بوون؛ بێز لێ هاتنەوە.

**repugnancy** (ri-pug′nən-si), *n.* = **repugnance.**

**repugnant** (ri-pug′nənt), *adj.* (١) نەگونجاو لەگەڵ؛ ناکۆك:
***( actions ~ to his words)***
(٢) بەرهەڵستیکەر؛ بەربەرەکانیکەر: ***( ~ forces)*** .
(٣) پیس؛ بۆگەن؛ قێز لێ بووەوە؛ ناپەسەند؛ ناشرین ( کردەوە):
***( a ~ odor, act, attitude, person, etc.)***

**repulse** (ri-puls′), *v.t.* (١) بەرهەڵستی کردن و پاڵ پێوەنانە دواوە؛
گەڕاندنەوە دواوە ( هێرش)؛ هەڵبڕین ( دوژمن)؛ بەربەستکردن:
***( to ~ an attack)***
(٢) لە لووت دان؛ شکاندن؛ پەسەند نەکردن؛ نەویستن؛ ساردبوون لەگەڵدا
*n.* (١) بەرهەڵستی؛ بەرگری؛ هەڵبڕینی دوژمن.
(٢) ساردی نواندن لەگەڵدا؛ نەویستن؛ شکاندن.

**repulsion** (ri-pul′shən), *n.* (١) بەرهەڵستی؛ هەڵبڕینی دوژمن؛
پاڵ پێوەنانی دوژمن بۆ شوێنی خۆی.
(٢) ڕق؛ تین؛ قین لێ بوون؛ بێز؛ قێز لێ هاتنەوە.
(٣) لەیەك دووركەوتنەوە (فیزیا).

**repulsive** (ri-pul′siv), *adj.* (١) پاڵ پێوەنەر؛ دوورخەرەوە؛
بەرهەڵستیکەر. (٢) بۆگەن؛ پیس؛ ناشرین ( ڕووخسار، کردەوە)؛ قێز لێ بووەوە

**reputable** (rep′yoo-tə-b'l), *adj.* (١) جێی بڕوایە؛ بەڕێز؛
بڕواپێکراو؛ بەناو؛ بە بایەخ.
(٢) سەنگین ( ووشە)؛ هەمووکەس بەکاری دەهێنێ ( ووشە).
**-reputability *(n.)*.**

**reputation** (rep′yoo-tā′shən), *n.* (١) ناوبانگ؛ ناو؛ ناوداری.
(٢) ناوبانگی باش؛ ناوی باش.
(٣) بەوە ناسران؛ بە شتێك ناو دەرکردن:
***( He has a ~ of being a thief.)***

**repute** (ri-pūt′), *v.t.* وادانان؛ بەوە ناسران:
***( He is ~d to be stingy.)***

*n.* (١) ناوبانگ؛ ناو: ***( a city of bad ~ )*** .
(٢) ناوبانگی باش؛ ناوی باش: ***( a man of ~ )*** .

**reputed** (ri-pūt′id), *adj.* وا ناسراو؛ وا دانراو:
***( the ~ author of a book)***

**reputedly** (ri-pūt′id-li), *adv.* گوایە؛ بەناو.

**request** (ri-kwest′), *n.* (١) داواکردن
(٢) داخوازی؛ داوا؛ خواست؛ تکا.
*v.t.* (١) داوالێکردن؛ داواکردن؛ داخوازی کردن. (٢) تکاکردن.
**by request,** لەسەر داخوازی جەماوەر؛ لەسەر داوا.

**requiem** (rē′kwi-əm), *n.* (١) (ا) نوێژو نزای جەماوەری بۆ گیانی مردوویەك یا مردووان ( ئاینی کاسۆلیکی)؛ یادکردنەوە یا بیرەوەری مردوو.
(ب) مۆسیقای لێدراو لەم کاتەدا.
(٢) لاوانەوە بۆ گیانی مردوو؛ لاوانەوە؛ شیوەن؛ شین.

**require** (ri-kwīr′), *v.t.* (١) داواکردن: لەسەر سووربوون:
***( They ~ obedience.)***
(٢) فەرمان دان؛ داوالێکردن؛ پێ ووتن:
***( They ~d them to be present.)***
(٣) پێویست کردن؛ پێویست بوون؛ ویستن:
***( A hungry man ~s food.)***
*v.i.* داواکردن؛ زۆرکردن.

**required** (ri-kwīr′d), *adj.* پێویست

**requirement** (ri-kwīr′mənt), *n.* (١) داواکاری
(٢) مەرج: مەرجی پێشەکی؛ پێویستی:
***( the ~s for college entrance)***
(٣) پێویستی: شتی پێویست؛ ویستەمەنی.

**requisite** (rek′wə-zit), *adj.* پێویست: زۆر پێویست:
***( The ~ supplies for a journey.)***
*n.* شتی پێویست؛ پێویستی؛ ویستەمەنی.

**requisition** (rek′wə-zish′ən), *n.* (١) داوا؛ داواکردن.
(٢) داخوازی ڕەسمی دەزگایەکی میری یا کۆمپانیایەك بۆ کەرەسەو شتوومەك:
***( a ~ for supplies and equipment)***
(٣) مەرج؛ مەرجی سەرەکی؛ پێویست: ***( the ~ of college degree)*** .
(٤) داواکردنی گەڕاندنەوە یا دانەوە دەستی تاوانکارێك ( لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر)
*v.t.* (١) داواکردن: لێ سەندن: ***( ~ food for troops)*** .
(٢) داوالێکردن

**requital** (ri-kwīt′'l), *n.* (١) داواکردن؛ داواکاری؛ داوالێکران.
(٢) (ا) پاداشت؛ خەلات. (ب) تۆڵە.

**requite** (ri-kwīt′), *v.t.* (١) بۆ گەڕاندنەوە (چاکە، خۆشەویستی)؛ پاداشت دانەوە: ***( to ~ another's love)*** .
(٢) تۆڵە سەنەندنەوە؛ تۆڵە لێکردنەوە.

**reredos** (rêr′dos), *n.* پەردە یا تیغە دیواری پشت قوربانیگا ( کلێسە).

**reroute** (rē-rōōt′, rē-rout′), *v.t.* بە ڕێگەیەکی تردا ناردن؛ بە ڕێیەکی جیاوازدا ناردنەوە.

**rerun** (rē-run′), *v.t.* پیشاندانەوە ( فیلمی سینەما)؛ دووبارە پیشاندان.
*n.* پیشاندانەوەی فیلمێکی سینەمایی یا بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی.

**resalable** (rē-sāl′ə-b'l), *adj.* دەفرۆشرێتەوە.

**resale** (rē-sāl′, rē′sāl′), *n.* فرۆشتنەوە.

**rescind** (ri-sind′), *v.t.* هەڵوەشاندنەوە ( یاسا)؛ پووچ کردنەوە؛ سڕینەوە؛ لابردن: ***( to ~ a law)*** .
**-rescinable** *(adj.)*.

**rescission** (ri-sizh′ən, ri-sish′ən), *n.* هەڵوەشانەوە ( یاسا)؛ پووچ کردنەوە؛ سڕینەوە؛ لابردن.

**rescissory** (ri-sis′ə-ri, ri-siz′ə-ri), *adj.* تایبەتی بە یاسا هەڵوەشاندنەوە یا پووچ کردنەوە.

**rescript** (rē′skript), *n.* (١) فەرمانی ئیمپراتۆری ڕۆما یا پاپا؛ وەڵامی ئیمپراتۆری ڕۆما یا پاپا دەربارەی پرسیارێك یا داخوازییەك.
(٢) فەرمان. (٣) (ا) نووسینەوە؛ دووبارە نووسین.
(ب) شتێکی سەرلەنوێ نووسراو.
(٤) فەرمانی دادگا بۆ دادنووس یا هی دادگای بەرز بۆ دادگای نزم دەربارەی داواکارییەك.

**rescue** (res′kū), *v.t.* (١) ڕزگارکردن؛ فریاکەوتن؛ هاتن بە هاوارەوە.
(٢) بە زۆر دەرهێنان لە بەندیخانە؛ بە زۆر شت سەندنەوە.
*n.* (١) ڕزگارکردن؛ ڕزگاری؛ فریاکەوتن.
(٢) بە زۆر لە بەندیخانە ڕزگارکردن؛ بە زۆر شت سەندنەوە.

**research** (ri-sūrch′, rē′sūrch), *n.* لێکۆڵینەوە؛ کنەکردن؛ لێکۆڵینەوەی زانستی.
*v.i.* لێکۆڵینەوە؛ کنەکردن.

**researcher** (ri-sūrch′ēr, rē′sūrch′ēr), *n.* لێکۆڵەرەوە؛ کنەکار.

**reseat** (rē-sēt′), *v.t.* (١) دانیشاندنەوە.
(٢) کورسی تازە تێخستن؛ کورسی تازەکردنەوە.

**reseau** (rā-zō′), *n.* (١) تۆڕی نەقش لەسەر کراو.
(٢) پەردە یا تۆڕی ڕەنگاوڕەنگ ( وێنەگەری).

**resect** (ri-sekt′), *v.t.* بڕین یا لابردنی بەشێکی ئەندامێکی لەش بە نەشتەرگەری.

**resection** (ri-sek′shən), *n.* بڕین یا لێکردنەوەی پارچەیەك لە ئەندامێکی لەش بە نەشتەرگەری

**reseda** (ri-sē′də), *n.* (١) ڕووەکێکە گوڵی بۆن خۆش دەگرێ.
(٢) ڕەنگی سەوزی خۆڵەمێشی یا زەیتوونی.

**resemblance** (ri-zem′bləns), *n.* (١) لێکچوون؛ لێکردن؛ هاوشێوەیی. (٢) وێنە. (٣) [Obs.]، لەوانە بوون؛ بۆ هەبوون.

**resemble** (ri-zem′b'l), *v.t.* (١) لێ چوون؛ لێکردن؛ لێکچوون؛ هاوشێوە بوون: ***( He ~s his father.)*** .
(٢)[Archaic]، بەراووردکردن؛ لەیەك چوواندن.

**resend** (rē-send′), *v.t.* (١) سەرلەنوێ ناردن یا ناردنەوە.
(٢) گەڕاندنەوە؛ ناردنەوە.

**resent** (ri-zent′), *v.t.* ڕق لێ بوون؛ لێ پەست بوون؛ نارەزایی دەربڕین؛ بەدڵ نەبوون:
***( He ~s criticism.; He ~s her indifference toward him.)***

**resentful** (ri-zent′fəl), *adj.* کینە لە دڵ؛ کینەدار؛ قین لە دڵ؛ داخ لە دڵ.
**-resentfully** *(adv.)*; **resentfullness** *(n.)*.

**resentment** (ri-zent′mənt), *n.* ڕق؛ قین؛ کینە؛ قین لێ بوون؛ لێ پڕبوون؛ نارەزایی.

**reservation** (rez′ēr-vā′shən), *n.* (١) هەڵگرتن ( بۆ دواڕۆژ)؛ خستنە لاوە؛ هێشتنەوە. (٢) شتی هەڵگیراو یا هێڵراوە؛ یەدەك؛ سپێر.
(٣) مەرج؛ دوودڵی:
***( She accepted the invitation with mental ~s.)***
(٤) شوێن یا ناوچەیەکی تەرخان کراو بۆ مەبەستێکی تایبەتی:
***( an Indian ~ ; a military ~ )***
(٥) (ا) قۆرخ کردن ( ژووری ئوتێل، کورسی فڕۆکە...هتد)؛ جێ گرتن؛ جێ یا بلیت بۆ هەڵگرتن یا دانان: ***( We made ~ at this hotel.)*** .
(ب) جێی قۆرخ کراو یا هەڵگیراو ( لە ئوتێل، فڕۆکە، شەمەندەفەر، یا چێشتخانەدا). (ج) بلیتی ئەم قۆرخ کردنە یا جێ گرتنە.

**reserve** (ri-zūrv′), *v.t.* (١) هەڵگرتن بۆ دواڕۆژ؛ گلدانەوە.
(٢) قۆرخ کردن؛ هەڵگرتن یا دانان بۆ کەسێکی تایبەتی یا مەبەستێکی تایبەتی؛ گرتن ( جێگە، کورسی). (٣) بۆ خۆ هەڵگرتن؛ دان بەخۆ:
***( I ~ the right to disagree.)***
*n.* (١) یەدەك؛ سپێر؛ شتی هەڵگیراو بۆ دواڕۆژ ( ئازووقە، قایمەکاری).
(٢) هەڵگیران بۆ دواڕۆژ؛ خرانە لاوە. (٣) مەرج؛ دوودڵی.

(٤) هەست و بیروڕای خۆ لە خەڵك شاردنەوە.
(٥) شەرمنی، خۆگرتن؛ سەنگینی؛ بێ دەنگی.
(٦) سەرمایەی هەڵگیراو بۆ تەنگانە لەلایەن بانق یا دەزگای ترەوە؛ قایمەکاری.
(٧) ڕەوی پارێزراو یا شوێنی دانراو بۆ مەبەستی تایبەتی: *( a forest ~ )* .
(٨) *(pl.)* ، هێزی چەکداری تەنگانە.
*adj.* هەڵگیراو بۆ دواڕۆژ؛ دانراو بۆ تەنگانە: *( a ~ supply of food)* .
**in resrve,** هەڵگیراو بۆ کاتی خۆی؛ دانراو بۆ کەسێك یا کاتێکی تایبەتی.
**without resrve,** بەبێ مەرج.
**reserved** (ri-zũrvd′), *adj.* (١) قۆرخ کراو؛ گیراو ( جێ)؛ دانراو بۆ کەسێك یا مەبەستێکی تایبەتی (٢) شەرمن؛ بێ دەنگ.
**reservist** (ri-zũr′vist), *n.* سەربازی هێزی چەکداری تەنگانە
**reservior** (rez′ĕr-vwär′, rez′ĕr-vôr′), *n.* (١) عەماراو؛ نەستێل؛ نەستێرك (٢) تانکی؛ دەفری شلە. (٣) کیس یا توورەکە ( زیندەوەرزانی).
(٤) عەمار ( مەجاز)؛ کۆگا؛ جێی شت کۆمەڵ بوون؛ بڕێکی زۆر:
*( a ~ of good will)*
**reset** (rē-set′), *v.t.* (١) دووبارە گرتنەوە ( ئێسقانی شکاو)؛ چاك کردنەوە: *( to ~ a broken arm)*
(٢) ڕاستکردنەوە ( کاتژمێر)؛ دانانەوە لەسەر کاتی ڕاست
*( to ~ an alarm oclock)*
*n.* (١) گرتنەوەی ئێسقانی شکاو.
(٢) ئێسقانی شکاوی دووبارە گیراوە؛ شتی سەرلەنوێ چاك کراو یا ڕێکخراو.
(٣) ڕووەکی دووبارە نێژراو
**reship** (rē-ship′), *v.t.* (١) دووبارە ناردن بە کەشتی.
(٢) گواستنەوە بۆ کەشتییەکی تر.
*v.i.* (١) سواری کەشتی بوونەوە؛ دووبارە بە کەشتی ڕۆیشتن.
(٢) ناوی خۆ نووسین بۆ کارکردن لەسەر کەشتی ئایندەی کەشتی بازرگانی (کەشتیوان)
**-reshipment** *(n.)*.
**reshuffle** (rē-shuf′′l), *v.t.* (١) دووبارە تێکەڵاوکردنەوە (کاغەزی یاری یا قومار. (٢) گۆڕین ( ئەنجوومەنی وەزیران)؛ ڕێکخستنەوە.
*n.* گۆڕان ئەنجوومەنی وەزیران؛ ڕێکخستنەوە: *( a cabinet ~ )* .
**reside** (ri-zīd′), *v.i.* (١) نیشتەجێ بوون ( بۆ ماوەیەکی زۆر)؛ تێدا ژیان دانیشتن: *( He still ~s in the same house.)* .
(٢) تێدابوون ؛ تایبەخۆ؛ هەبوون بە زگماکی.
(٣) بە دەست بوون؛ درانە دەست؛ پێ سپێردران ( دەسەڵات):
*( The real power ~s in the people.)*
**residence** (rez′i-dəns), *n.* (١) ژیان لە شوێنێك؛ ماوەی ئەم ژیانە؛ نیشتەجێیی *( His ~ in Europe matured him.)* .
(٢) نیشتەجێیی کاتی قوتابیێتی لە زانکۆدا؛ ماوەی ئەم نیشتەجێیییە.
(٣) ماڵ؛ نیشتەجێ؛ نشینگە. (٤) خانووبەرە؛ کۆشك
(٥) ماوەی ژیان لە خانوویەك یا شوێنێکدا.
**residency** (rez′i-dən-si), *n.* (١) ماڵ؛ خانە؛ نشینگە؛
(٢) نشینگە یا بارەگای نوێنەری دبلۆماسی ( بەتایبەتی لە وڵاتی ژێردەستەدا).
(٣) ماوەی فێربوونی پسپۆڕی پزیشك.
**resident** (rez′i-dənt), *adj.* (١) نیشتەجێ؛ نیشتەنی؛ دانیشتووی شوێنێك. (٢) پزیشکی نیشتەجێ:
*( a ~ physician in a hospital)*
(٣) ناوکی؛ شاراوە.
(٤) ناکۆچەر ( باڵندە)؛ نیشتەنی بە درێژایی ساڵ.
*n.* (١) نیشتەجێ؛ نیشتەنی؛ دانیشتووی هەمیشەیی شوێنێك.
(٢) نوێنەری دبلۆماسی ( بەتایبەتی لە وڵاتی ژێردەستەدا).
(٣) باڵندەی نیشتەنی یا ناکۆچەر. (٤) جێگر.
**residential** (rez′i-den′shəl), *adj.* (١) تایبەتی بە ماڵ.
(٢) بۆ تێدا ژیان دەشێت؛ نیشتەجێیی؛ هی نیشتەنی: *( a ~ district)* .
**residual** (ri-zij′ōō-əl), *adj. & n.* (١) پاشماوە؛ پاشەڕۆك؛ دواماوە.
(٢) ژمارەی دواماوە پاش لێ دەرکردن ( ژمارەو پێوان).
(٣) هەڵەی ژماردن ( ژمارەو پێوان)؛ هەڵەی چاك نەکراو.
(٤) *(pl.)* ، ئەو مزەی دەدرێ بە نووانەرێکی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی هەر جارێك بەرنامەکە پیشان بدرێتەوە.
**residuary** (ri-zij′ōō-er′i), *adj.* هی دواماوە؛ هی پاشماوە.
**residue** (rez′ə-dōō′, rez′ə-dū′), *n.* (١) پاشماوە؛ دواماوە؛ ماوە؛ پاشەڕۆك. (٢) خڵتە. (٣) پاشماوەی میراتی پاش دابەشکردنی بەسەر میراتبەرو خاوەن قەرزدا
**residuum** (ri-zij′ōō-əm), *n.* پاشماوە؛ دواماوە؛ پاشەڕۆك؛ خڵتە.
**resign** (ri-zīn′), *v.t.* (١) دەست هەڵگرتن ( لە ماف یا داوایەك).
(٢) وازهێنان لەکار؛ دەست لە ئیش هەڵگرتن بە تەواوی.
(٣) زۆر لە خۆ کردن بۆ ڕازی بوون بە شتێك؛ بە ناچاری پێ ڕازی بوون
*( You have to ~ yourself to do without luxuries.)*
*v.i.* واز لە کار هێنان بە ڕەسمی؛ دەست لە ئیش هەڵگرتن:
*( He ~ed from the presidency.)*
**resign oneself,** بە ناچاری پێ قایل بوون؛ مل بۆ کەچ کردن لە ناچاریدا: *( to ~ oneself to a life of poverty)* .
**resign** (rē-sīn′), *v.t.* سەرلەنوێ مۆرکردن؛ ئیمزاکردنەوە.
**resignation** (rez′ig-nā′shən), *n.* (١) واز لە کار هێنان بە ڕەسمی؛ دەست هەڵگرتن لە ئیش بە یەکجاری. (٢) بەیاننامەی ئەم وازهێنانە؛ وازنامە.
(٣) پێ قایل بوونی ناچاری؛ ملکەچی ناچاری؛ مل نان؛ شان دانەبەر؛ ماتەمینی
**resigned** (ri-zīnd′), *adj.* ملکەچ بە ناچاری؛ ملدەر؛ ماتەمین؛ شان دەرەبەر: *( ~ed to one's fate)* .
**resile** (ri-zīl′), *v.i.* خۆگرتنەوە؛ گەڕانەوە شێوەی پێشوو؛ شێوەی خۆ وەرگرتنەوە؛ هەڵسانەوە.
**resilience** (ri-zil′i-əns, ri-zil′yəns), *n.* (١) شێوەی خۆ وەرگرتنەوە؛ نەرمی؛ بەرگەگرتن.
(٢) توانای خۆگرتنەوە؛ توانای هەڵسانەوە ( پاش تێکشکان یا ژێرکەوتن)؛ جیڕی؛ توانای گەڕانەوە بۆ دۆخی چاکی جاران:
*( These people are known for their ~ .)*
**resiliency** (ri-zil′i-ən-si, ri-zil′yən-si), *n.* = **resilence.**
**resilient** (ri-zil′i-ənt, ri-zil′yənt), *adj.* (١) لاستیکی؛ نەرم؛ شێوەی خۆ وەرگرەوە. (٢) زووهەڵساوە ( پاش تێکشکان یا ژێرکەوتن)؛ جیڕ؛ بەرگەگر؛ نەبەزیو.
**resin** (rez′′n), *n.* (١) جەوی؛ شیلەیەکی لینجە لە هەندێك دارودرەخت دێت کە بریندار دەکرێ یا دەبڕڕێ.
(٢) ماددەیەکی کیمیایی گیراوەیە وەك جەوی وایە.
*v.t.* جەوی لێدان؛ جەوی لێخشاندن.
**resinate** (rez′′n-āt′), *v.t.* جەوی تێکردن.
**resiniferous** (rez′′n-if′ĕr-əs), *adj.* جەوی لێ دەدرێت؛ جەوی لێ دێتە بەرهەم.
**resinoid** (rez′′n-oid′), *adj.* تایبەتی بە جەوی؛ لە جەوی دەچێت؛ جەوی تێدایە.
*n.* ماددەیەك وەك جەوی.
**resist** (ri-zist′), *v.t.* بەرهەڵستی کردن؛ بەرگری کردن؛ خۆگرتن؛ مل نەدان؛ خۆ بەدەستەوە نەدان؛ بەربەرەکانی کردن؛ دژ وەستان؛ خۆڕاگرتن
*n.* ماددەیەکە لە ڕوویەك دەدرێ بۆ ڕێ گرتن لە خورانەوە.
**resistance** (ri-zis′təns), *n.* (١) بەرهەڵستی؛ بەرگری؛ مل نەدان؛ بەربەرەکانی؛ خۆ بەدەستەوە نەدان؛ خۆڕاگرتن.
(٢) توانای بەرگری؛ توانای بەربەرەکانی.
(٣) [R-]، هێزی بەرگری دژ بە داگیرکەرانی وڵات.
**resistant** (ri-zis′tənt), *adj.* بەرگر؛ بەرهەڵستیکەر؛ مل نەدەر.
*n.* مرۆڤ یا شتی بەرگر.
**resistible** (ri-zis′tə-b'l), *adj.* بەرگری دەکرێ؛ بەری دەگیرێ؛ بەرهەڵستی دەکرێ.

**-resistibility** ***(n.).***

**resistive** (ri-zis′tiv), ***adj.*** بەرگر؛ بەرهەڵستیکەر؛ بەرگریکەر.

**-resistivity** ***(n.).***

**resistless** (ri-zist′lis), ***adj.*** (١) بەرگری ناکریٚ؛ بەرهەڵستی ناکریٚ.
(٢) بەرهەڵستی نەکەر؛ بەرگری نەکەر؛ تواناى بەرهەڵستی نییە.

**resistor** (ri-zis′tēr), ***n.*** ئامێرى بەرهەڵستی بازنەى کارەبا.

**resoluble** (rez′ə-loo-b'l, rez′'l-yoo-b'l), ***adj.*** چارەسەر دەکریٚ؛ دەبڕڕێتەوە.

**-resolubility** ***(n.).***

**resolute** (rez′ə-lōōt′, rez′'l-ūt′), ***adj.*** سوور لەسەر؛ نەگۆڕ؛ دوودڵی نەکەر.

**-resolutely** ***(adv.)***; **resoluteness** ***(n.).***

**resolution** (rez′ə-lōō′shən, rez′'l-ū′shən), ***n.*** (١) بڕیاردان.
(٢) یەك لاکردنەوە؛ خستن بەلایەکدا. (٣) بڕیار؛ بڕیارنامە.
(٤) سووربوون لەسەر؛ نەگۆڕان؛ دوو دڵی نەکردن.
(٥) چارەسەری؛ چارەکردن؛ ئەنجام؛ بە ئەنجام گەیاندن.
(٦) نیشتنەوە ( ئاوساوی، تا).

**resolvable** (ri-zol′və-b'l), ***adj.*** چارەسەر دەکریٚ؛ چارەی بۆ دەدۆزرێتەوە.

**resolve** (ri-zolv′), ***v.t.*** (١) شیکردنەوە.
(٢) گۆڕان؛ بوون بە:
***( The discussion ~d itself into an argument.)***
(٣) بڕیار پێدان؛ والێکردن؛ والێکردن کە بڕیار بدات.
(٤) بڕیاردان: ***( We ~d to go.)*** .
(٥) (ا) چارەکردن؛ چارەسەرکردن: ***( to ~ a problem)*** .
(ب) لابردن ( گومان، دوودڵی)؛ ڕەواندنەوە؛ نەهێشتن.
(٦) بڕیاردان بە دەنگ لەسەر دان؛ خستن بە لایەکدا؛ بڕینەوە؛ یەکلاکردنەوە.
(٧) [Obs.]: تواندنەوە.
(٨) بوون بەهۆى نیشتنەوە ( ئاوساوی، تا).
(٩) پیشاندانی هەموو بەشەکانی بە جیا و بە ڕوونی.
***v.i.*** (١) یەکلابوونەوە؛ بە لایەکدا کەوتن.
(٢) بڕیاردان؛ گەیاندنە ئەنجام.
***n.*** (١) لەسەر سووربوون؛ نەگۆڕان؛ دوودڵی نەکردن: ***( They lack ~ .)*** .
(٢) بڕیار (٣) بڕیارى ڕەسمی ئەنجوومەنێك وەك پەرلەمان.

**resolved** (ri-zolvd′), ***adj.*** سوورە لەسەرى؛ نەگۆڕ؛ دوودڵی نەکەر.

**-resolvedly** ***(adv.).***

**resolvent** (ri-zol′vənt), ***adj. & n.*** (١) توێنەرەوە.
(٢) دەرمانی ئاوساوی نیشتنەوە.

**resonance** (rez′ə-nəns), ***n.*** زرنگانەوە؛ زرنگەزرنگ؛ دەنگدانەوە.

**resonant** (rez′ə-nənt), ***adj.*** (١) زرنگانەوە؛ لەرلەراوى ( دەنگ)؛ لەرزۆك: ***( a deep ~ voice)*** .
(٢) دەنگدەرەوە: ***( ~ walls)*** .

**resonate** (rez′ə-nāt′), ***v.i.*** زرنگانەوە؛ دەنگدانەوە؛ زرنگەزرنگ کردن.

**resonator** (rez′ə-nā′tēr), ***n.*** ئامێرى زرنگانەوە؛ ئامێرى دەنگدەرەوە.

**resorb** (ri-sôrb′), ***v.t.*** (١) هەڵمژینەوە؛ دووبارە هەڵمژین.
(٢) تواندنەوە و گۆڕین و هەڵمژینی خواردەمەنی.

**-resoption** ***(n.).***

**resort** (ri-zôrt′), ***v.i.*** (١) بۆ چوون ( بەتایبەتی بۆ سەیران یا گەشت)؛ چوون بۆ سەیرانگا:
***( People ~ to parks and beaches in the summer.)***
(٢) پەنا بۆ بردن؛ پەنا دانەبەر؛ داڵدە بۆ بردن:
***( He ~ed to extreme measures.)***
***n.*** (١) سەیرانگا؛ هاوینەهەوار؛ زستانە هەوار؛ گەشتگا: ***( a winter ~ )*** .
(٢) شوێنی کۆبوونەوە یا یەککگرتن: ***( a popular place of ~ )*** .
(٣) داڵدە؛ پەنا؛ پەناگا؛ چارە.

(٤) کەسێك یا شتێکی داڵدە بۆ براو؛ پەنا بۆ براو: ***( a last ~ )*** .

**resound** (ri-zound′), ***v.i.*** (١) زرنگانەوە؛ دەنگدانەوە.
(٢) دەنگێکی زل لێوە هاتن.
(٣) دەنگدانەوە ( مەجاز)؛ ناو دەرکردن:
***( His bravery ~ed all over the country.)***
***v.t.*** (١) دەنگدانەوە؛ زرنگانەوە. (٢) بە دەنگی بەرز ووتن.
(٣) پیاهەڵدان؛ ستایش کردن بە دەنگی بەرز.

**-resounding** ***(adj.)***; **resoundingly** ***(adv.).***

**resource** (ri-sôrs′, rē′sōrs), ***n.*** (١) داهات؛ دەرامەت.
(٢) (*pl.*) ، سامان، سەرمایە.
(٣) سامانی وڵات؛ سەرچاوەى سامان:
***( Our natural ~s include coal and petroleum.)***
(٤) هۆى جێبەجێکردن؛ هۆى فریاکەوتن؛ چارە؛ ڕێی ڕاپەڕاندنی کار.
(٥) (*pl.*) ، شێوەى کات بردنەسەر؛ شێوەى ڕابواردن.
(٦) شارەزایی؛ لێ زانین؛ بلیمەتی؛ زۆرزانی.

**resourceful** (ri-sôrs′fəl, ri-sōrs′fəl), ***adj.*** زۆرزان؛ لێهاتوو (بەتایبەتی لەکاتی تەنگانەدا)؛ کارامە؛ هەرگیز دانامێنیٚ بۆ هەرچ شتێك بیەوێ بیکات.

**-resourcefully** ***( adv.)***; **resourcefulness** ***(n.).***

**respect** (ri-spekt′), ***v.t.*** (١) ڕێزگرتن؛ ڕێزلێنان؛ ڕێزلێگرتن.
(٢) بەتەنگەوەهاتن: ***( R~ his privacy.)*** .
(٣) پەیوەندی پێوەبوون.
***n.*** (١) ڕێز: ***( They have great ~ for him.)*** .
(٢) بەتەنگەوەهاتن:
***( One must have ~ for the felling of others.)***
(٣) شێوەى ڕێز پیشاندان.
(٤) ڕوو؛ لا؛ بار:
***( In this ~ you are wrong.; They differ in two ~s.)***
(٥) دەربارە؛ سەبارەت بە: ***( with ~ to your problem)*** .

**in every respect,** لە هەموو ڕوویەکەوە.
**in respect of,** دەربارەى؛ سەبارەت بە؛ لە بابەت ئەوەوە.
**in respect that,** لەبەر؛ بەهۆى.
**pay one's last respects,** چوون بۆ پرسەى کەسێك.
**pay one's respects,** ڕێز پیشاندان بە سەرلێدان؛ چوون بۆ لا بۆ ڕێزلێگرتن: ***( He paid his respects to the mayor.)*** .

**respectability** (ri-spekt′tə-bil′ə-ti), ***n.*** (١) بەڕێزی؛ بەڕێزێتی؛ ڕێز لێ گیران؛ پایەداری؛ سەنگینی؛ بایەخداری.
(٢) خەڵکی بەڕێز؛ بەڕێزان؛ ڕێز لێ گیراوان.
(٣) (*pl.*) ، ئەو نەریتە کۆمەڵایەتی‌یانەى بەڕێزی پیشان دەدەن.

**respectable** (ri-spek′tə-b'l), ***adj.*** (١) بەڕێز؛ ڕێزدار؛ سەنگین؛ ڕێز لێ گیراو؛ پایەدار؛ شایانی ڕێزە.
(٢) پەسەند؛ بەجیٚ؛ درووست؛ باش: ***( a ~ hotel ; ~ behavior)*** .
(٣) باش؛ خراپ نییە؛ پەسەند:
***( His work was ~ , but not outstanding.)***
(٤) قەبارەدار؛ گەورە؛ زۆر؛ گاڵتەى پیٚ ناکریٚ ( ژمارە، قەبارە):
***( a ~ number, amount, etc.)***
(٥) خراپ نییە؛ باش؛ بەکاردێت: ***( a ~ suit of clothes)*** .

**-respectably** ***(adv.).***

**respectful** (ri-spekt′fəl), ***adj.*** ڕێزگر؛ نیشانەى ڕێزگرتنە:
***( a ~ person ; ~ behavior)***

**-respectfully** ***(adv.).***

**respecting** (ri-spek′tiŋ), ***prep.*** دەربارەى؛ سەبارەت بە؛ لە بابەت.

**respective** (ri-spek′tiv), ***adj.*** (١) هەریەکە هی خۆى؛ جیا؛ تایبەتی بە هەریەکێك:
***( The two women stood by their ~ husbands.;***

*They went back to their ~ rooms.)*
(٢) [Obs.]. لایەنگر
(٣) [Obs.]. بەڕێز؛ شایانی ڕێزە.
(٤) [Obs.]. بەگوێ.
**respectively** (ri-spek′tiv-li), *adv.* بەرودو : یەك لەدوای یەك؛
*( The first, second, and third prizes went to John, Mary, and George ~ .)* بە ڕیز؛ بە سەرد
**respiration** (res′pə-rā′shən), *n.* هەناسەدان.
**respirator** (res′pə-rā′ter), *n.* (١) شتێکە دەکرێتە دەم و لووت بۆ هەڵنەمژینی شتی پیس ( لە کرێشەو شتی وەها درووست دەکرێ).
(٢) ئامێری هەناسەپێدان. (٣) [British]. gas mask.
**respiratory** (ri-spīr′ə-tôr′i, res′pēr-ə-tōri), *adj.* تایبەتی بە هەناسەدان.
**respire** (ri-spīr′), *v.i.& v.t.* هەناسەدان.
**respite** (res′pit), *n.* (١) دواخستن بەتایبەتی هی سزای هەڵواسین).
(٢) مۆڵەت ( لە ئیش، نەخۆشی، کارەسات)؛ پشوو؛ ماوەی هێمنی و خامۆشی:
*( a ~ from pain, work, etc.)*
*v.t.* (١) مۆڵەت پێدان : کار، نەخۆشی، ئازار، کارەسات)؛ پشوو پێدان.
(٢) دواخستنی سزا ( بەتایبەتی هی هەڵواسین).
**resplendence** (ri-splen′dəns), *n. Also* **resplendency.** بریقە؛ بریسکە؛ درەوشانەوە.
**resplendent** (ri-splen′dənt), *adj.* بریقەدار؛ بریسکەدار؛ درەوشاوە؛ زۆر جوان و نایاب.
**respond** (ri-spond′), *v.i.* (١) وەڵام دانەوە.
(٢) بەدەنگەوەهاتن: *( He ~ed to their appeal for help.)* .
(٣) [Obs. or Rare]. هاوتابوون؛ بەرامبەربوون.
(٤) لێپرسینەوە ( دادگەری)؛ بەرپرسیاربوون.
*v.t.* وەڵام دانەوە.
*n.* (١) پایەی تاق ( خانووسازی).
(٢) خوێندنەوەی ئینجیل بە دەنگ و ئاوازەوە لەلایەن کۆرەسی کڵێسەوە.
**respondence** (ri-spon′dəns), *n. Also* **repondency.** وەڵام؛ وەڵام دانەوە.
**repondent** (ri-spon′dənt), *n.* (١) وەڵام دەرەوە؛ بەدەنگەوەهاتوو.
(٢) شکات لێکراو ( بەتایبەتی لە مەسەلەی تەڵاق و بەشکردنی سەرمایە دوای تەڵاق:
*adj.* وەڵام دەرەوە؛ بەدەنگەوەهاتوو.
**response** (ri-spons′), *n.* (١) وەڵام؛ وەڵام دانەوە.
(٢) بەدەنگەوە هاتن؛ وەڵام دانەوە ( لە ئەنجامی بزوێنەرێکی دەرەوەدا).
(٣) بۆ سەندنەوەی ووتەی قەشە لەلایەن کۆمەڵی نوێژکەران یا کۆرەسی کڵێسەوە
**responsibility** (ri-spon′sə-bil′ə-ti), *n.* (١) لێپرسینەوە؛ بەرپرسیاری (٢) پێویستی سەرشان؛ لە ئەستۆدا بوون.
**responsible** (ri-spon′sə-b'l), *adj.* (١) بەرپرسیار؛ لێپرسراو:
*( He is ~ for the car.)*
(٢) لێپرسراو؛ کاربەدەست؛ شت بەدەست: *( He has a ~ position.)* .
(٣) هۆی ڕوودانێك یا بارێکی تایبەتی؛ سووچدار
*( He is ~ for what happend.)*
(٤) (ا) پشت پێ بەستراو؛ جێی بڕوایە: *( She is a ~ person.)* .
(ب) تێگەیشتوو؛ ژیر.
(ج) پشتی پێ دەبەسترێ کە قەرزی خۆی بداتەوەو پێویستی سەرشانی جێبەجێ بکات؛ سەرڕاست.
**-responsibly** *(adv.).*
**responsion** (ri-spon′shən), *n.* (١) وەڵام؛ وەڵام دانەوە.
(٢) (*pl.*) . یەکەم تاقیکردنەوەی سێ تاقیکردنەوە بۆ بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە زانکۆی ئۆکسفۆرد.

**responsive** (ri-spon′siv), *adj.* (١) وەڵام دەرەوە.
(٢) بەدەنگەوەهاتوو؛ بەهەست؛ بە هاوارەوە هاتوو؛ هاوسۆز؛ هاوهەست:
*( a ~ audience)*
**-respensively** *(adv.)*; **respensiveness** *(n.).*
**responsory** (ri-spon′sə-ri), *n.* بۆ سەندنەوەی ووتەی قەشە لە کڵێسەدا.
**res publica** (rēz pub′li-kə), [L.], کۆمار؛ میری؛ وولات.
**rest** (rest), *n.* (١) (ا) نوستن؛ ڕاکشان؛ پاڵدانەوە. (ب) ماندوێتی دەرچوون.
(٢) حەوانەوە؛ حەسانەوە. (٣) پشوو؛ ووچان.
(٤) ئاسوودەیی؛ مێشك حەسانەوە.
(٥) حەسانەوەی مردن؛ کشوماتی یا خامۆشی مردن.
(٦) وەستان؛ نەجوڵان؛ نەبزوان.
(٧) جێی حەوانەوە؛ جێی وەستان ( لە کاتی گەشتدا)؛ خان.
(٨) شوێنی لەسەر ڕاگیر بوون، وەستان، یا دانان؛ پاڵپشت.
(٩) وەستانێکی کەم ( مۆسیقا، دێڕی هۆنراوە).
*v.i.* (١) (ا) ماندوێتی دەرچوون ( بە نوستن). (ب) نوستن؛ ڕاکشان.
(٢) حەوانەوە؛ حەسانەوە. (٣) پشوودان؛ ووچان گرتن.
(٤) مردن؛ حەوانەوە بە مردن.
(٥) بێ دەنگ بوون؛ وەستان؛ سرەوتن؛ جووڵە لێ بڕان؛ نەبزوان.
(٦) نوستن ( مەجاز)؛ مانەوە بەبێ دەست لێدان: *( Let the matter rest.)* .
(٧) پاڵ پێوە دان؛ کەوتنە سەر؛ پاڵدانەوە.
(٨) لە شوێنێکدا بوون: *( The fault ~s with him.)* .
(٩) لەسەر بەندبوون؛ کەوتنە سەر:
*( Our future ~s on your shoulders.)*
(١٠) ئاراستەکردن؛ لەسەر گیرسانەوە ( مەجاز؛ چاو تێ بڕین:
*( His eyes ~ed on her picture.)*
(١١) بە بەیاری مانەوە؛ نەکێڵران.
(١٢) دوایی پێ هاتنی داواکارییەك ( دادگەری).
*v.t.* (١) (ا) حەواندنەوە؛ حەساندنەوە. (ب) پشووپێدان؛ ووچان گرتن
(٢) دانان؛ خستنەسەر: *( ~ your head on the pillow.)* .
(٣) لەسەر دانان؛ کردن بە بنچینە بۆ:
*( He ~ed his argument on trivialities.)*
(٤) ئاراستەکردن؛ چاو خستنەسەر؛ چاو تێ بڕین.
(٥) وەستاندن.
(٦) دوایی پێ هێنانی داواکارییەك ( دادگەری):
*( The State ~s its case.)*
**at rest,** (١) نووستوو. (٢) جووڵە لێ بڕاو.
(٣) لە ئاسوودەدایە؛ پڕ ئاسوودە؛ بێباك.
(٤) مردوو.
**lay to rest,** ناشتن (مردوو):
*( He was laid to rest last week.)*
**rest** (rest), *n.* (١) (ا) ماوە؛ پاشماوە. (ب) ئەوانی تر؛ ئەوانەی ماونەتەوە.
(٢) [British]، پارەی زیادە یا هەڵگیراو.
*v.i.* (١) بەردەوام بوون لەسەر؛ وەها مانەوە؛ بوون:
*( ~ assured that we will go.)*
(٢) [Obs.]، لەدوا مانەوە؛ پاشماوە مانەوە.
**restate** (rē-stāt′), *v.t.* (١) ووتنەوە؛ دووبارە ووتن؛ سەرلەنوێ ووتنەوە.
(٢) بە شێوەیەکی تازە ووتن؛ داڕشتنەوەو ووتنەوە.
**-restatement** *(n.).*
**restaurant** (res′tə-rənt, res′tə-ränt′), *n.* چێشتخانە.
**restauranteur** (res′tə-rə-tūr′), *n.* خاوەن چێشتخانە؛ کارگێڕی چێشتخانە.
**restful** (rest′fəl), *adj.* (١) حەوێنەرەوە؛ ئاسوودەبەخش.
(٢) پڕ ئاسوودە؛ بێ ئێش و ئازار؛ حەساوە:
*( The patient spent a ~ night.)*

**-restfully** *(adv.)*; **resfulness** *(n.).*
**restitution** (res´tə-to͞o′shən, res´tə-tū′shən), ***n.*** (١) دانەوەی شتێك بە خاوەنەكەی خۆی. (٢) بۆ بژاردن. (٣) گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران.
(٤) شێوەی خۆ وەرگرتنەوەی شتێكی لاستیكی پاش قوپاندنی.
**restive** (res′tiv), ***adj.*** (١) لاتراسكە بەستوو ( ئەسپ)؛ مانگر.
(٢) سەركێش؛ كەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ لاسار.
(٣) بێ ئارام؛ نەسرەوتوو؛ بێ سرەوت.
**restless** (rest′lis), ***adj.*** (١) بێ ئارام؛ بێ سرەوت؛ جیوەتێكراو (مەجاز).
(٢) بێ حەوانەوە؛ بێ خەو: ***( a ~ night)*** .
(٣) هەرگیز نەوەستاو: ***( the ~ sea)*** .
(٤) بێزار؛ ناڕازی.
**-restlessly** *(adv.)*; **restlessness** *(n.).*
**restock** (rē-stok′), ***v.t.*** شتوومەكی تازە بۆ هێنان (دووكان، كۆگا)؛ شوێن پڕكردنەوەی شتوومەكی فرۆشراو یا بەكارهێنراو.
**restoration** (res´tə-rā′shən), ***n.*** (١) دانانەوە؛ دانرانەوە؛ دامەزراندنەوە (٢) گەڕاندنەوە بۆ دۆخی جاران یا پێشوو.
(٣) چاك كردنەوە ( خانوو، شتی ناومال):
***( the ~ of a house, a piece of furniture, etc.)***
(٤) چاكبوونەوە؛ لە نەخۆشی هەڵسانەوە؛ بووژانەوە.
(٥) شتێكی چاككراوە یا پینەكراوە.
**the Restoration,** (١) گەڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتی بۆ ئینگلتەرە ساڵی ١٦٦٠ بە پاشایەتی چارلسی دووەم.
(٢) ماوەی پاشایەتی چارلسی دووەم لە ساڵی ١٦٦٠–١٦٨٥.
**restorative** (ri-stôr′ə-tiv, ri-stō′rə-tiv), ***adj.*** (١) چاككەرەوە ( دەرمان)؛ بووژێنەرەوە؛ هۆش هێنەرەوە بەر خۆ.
(٢) تازەكەرەوە؛ گەڕێنەرەوە بۆ دۆخی جاران؛ دامەزرێنەرەوە.
***n.*** دەرمانی هۆش هێنەرەوە بەر خۆ؛ دەرمانی چاككەرەوە.
**restore** (ri-stôr′, ri-stōr′), ***v.t.*** (١) دانەوە بە خاوەنی خۆی؛ بۆ گەڕاندنەوە. (٢) چاك كردنەوە؛ گەڕاندنەوە بۆ دۆخی جاران یا باری پێشوو:
***( to ~ a building, painting, etc.)***
(٣) دانانەوە لەسەر پلەوپایەی خۆی؛ گەڕاندنەوە بۆ پلەی پێشوو:
***( to ~ a king to his throne)***
(٤) بووژاندنەوە؛ چاك كردنەوە: ***( to ~ someone to health)*** .
(٥) سەندنەوە؛ دەمەزراندنەوە؛ هێنانەوە:
***( to ~ one's rights ; to ~ decency to the government)***
**restrain** (ri-strān′), ***v.t.*** (١) ڕاگرتن؛ خۆڕاگرتن؛ وەستاندن؛ بەربەستكردن؛ ڕێ لێگرتن. (٢) جڵەوگرتن؛ دابینكردن؛ گرتن.
(٣) خستنە بەندیخانەوە یا شێتخانەوە؛ گرتن.
(٤) سنوور بۆ دانان؛ بەستنەوە.
**restraint** (ri-strānt′), ***n.*** (١) ڕاگرتن؛ خۆڕاگرتن؛ ڕێ لێگرتن.
(٢) سەربەستی لێ سەندنەوە؛ بێ سەربەستی؛ بەستنەوە.
(٣) ڕاگر؛ ڕاگیركەر؛ كۆسپ؛ تەگەرە.
(٤) هەستی خۆ شاردنەوە؛ هەست دەرنەخستن یا پێشێل كردن.
**restrict** (ri-strikt′), ***v.t.*** سنوور بۆ دانان؛ بەستنەوە؛ كەمكردنەوە؛ ڕێ لێگرتن؛ قەدەغەكردن: ***( The government ~ed his movements.)*** .
**restricted** (ri-strik′tid), ***adj.*** (١) بەستراوە؛ سنوور بۆ دانراو.
(٢) قەدەغەكراو؛ قەدەغەیە بۆ هەندێ ڕەگەز، كەس...هتد:
***( a ~ hotel , neighborhood, etc.)***
**restriction** (ri-strik′shən), ***n.*** (١) سنوور بۆ دانان؛ ڕێ لێگرتن؛ قەدەغە كردن؛ بەسترانەوە.
(٢) سنوور؛ كۆسپ؛ قەدەغە: ***( to place ~s on foreign trade)*** .
**restrictive** (ri-strik′tiv), ***adj.*** (١) بەستەرەوە؛ ڕێ لێگر؛ دەست بەستەرەوە؛ قەدەغەیی: ***( ~ regulations)*** .
(٢) بەستەرەوە ( ڕێزمان)؛ تایبەتی بە دەستەواژەیەك یا پارستەیەك كە پێویستە بۆ مانای ڕستەكەو دەیبەستێتەوە: (لە ڕستەی:
People *who read a great deal* have large vocabularies.
" *who read a great deal* " پارستەی بەستەرەوەیە).
**rest-room** (rest′ro͞om´, rest′room´), ***n.*** ئاودەستخانە (بەتایبەتی لە شوێنی گشتیدا)؛ ئاودەست؛ پێشاو.
(هەروەها " **rest room** ").
**result** (ri-zult′), ***v.i.*** (١) لێوە پەیدابوون؛ ئەنجام لێ بوونەوە:
***( Learning ~s from study.)***
(٢) بوون بە هۆ: ***( The discussion ~ed in new action.)*** .
***n.*** بەرهەم؛ بەر.
**resultant** (ri-zul′t'nt), ***adj.*** لێوە پەیدابوو؛ ئەنجامی ئەوەیە.
***n.*** (١) ئەنجام؛ سەرەنجام. (٢) هێز ( فیزیا).
**resume** (ri-zo͞om′, ri-zūm′), ***v.t.*** (١) وەرگرتنەوە:
***( He ~d his seat.)***
(٢) دەستپێكردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە: ***( to ~ work)*** .
***v.i.*** دەستپێكردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە؛ سەرهەڵدانەوە؛ هەڵدانەوە.
**-resumble** *(adj.).*
**résumé** (rā′zoo-mā´, rez′o͞o-mā´), ***n.*** (١) كورتە؛ پوختە.
(٢) كورتەی ژیننامە؛ كورتەی خوێندن و پیشەو كاری ڕابوردوو (كەسێك كە بۆ ئیش دەگەڕێ دەیداتە خاوەن كار).
**resumption** (ri-zump′shən), ***n.*** دەستپێكردنەوە؛ تێهەڵچوونەوە؛ دەستپێكرانەوە.
**resupinate** (ri-so͞o′pə-nāt´, ri-sū′pə-nāt′), ***adj.*** هەڵگەڕاوە یا لە سەربەرەوخوار چوو ( وەك هەندێ گوڵ).
**resupine** (rē′soo-pīn′, rē′syoo-pīn´), ***adj.*** لەسەر پشت پاڵكەوتوو.
**resurge** (ri-sũrj′), ***v.i.*** سەرهەڵدانەوە؛ زیندووبوونەوە؛ بووژانەوە؛ هەڵچوون.
**resurgence** (ri-sũr′jəns), ***n.*** سەرهەڵدانەوە؛ سەر بەرزكردنەوە؛ زیندووبوونەوە؛ بووژانەوە: ***( a ~ of nationalistic feelings)*** .
**resurgent** (ri-sũr′jənt), ***adj.*** سەرهەڵدەرەوە؛ زیندووبووەوە؛ بووژاوە.
**resurrect** (rez´ə-rekt′), ***v.t.*** (١) زیندووكردنەوە؛ مردوو زیندووكردنەوە. (٢) بووژاندنەوە؛ بزواندنەوە؛ هێنانەوە بەرچاو؛ هێنانەوە پێشەوە.
***v.i.*** زیندووبوونەوە.
**resurrection** (rez´ə-rek′shən), ***n.*** (١) زیندووبوونەوەی مردوو.
(٢) بزووتنەوە؛ بووژانەوە؛ زیندووبوونەوە ( مەجاز).
**the Resurrection,** (١) زیندووبوونەوەی عیسا پاش هەڵواسینی.
(٢) زیندووبوونەوەی مردووان لە ڕۆژی قیامەتدا.
**resurrectionist** (rez´ə-rek′shən-ist), ***n.*** (١) مردوو لەگۆڕ دەرهێنەر بۆ فرۆشتنی و یەكالاكردنەوەی؛ لاشەدز
(٢) شتی كۆن و لەبیرچوو زیندووكەرەوە.
(٣) باوەڕدار بە زیندووبوونەوەی مردوو و ڕۆژی قیامەت.
**resurvey** (rē´sẽr-vā′), ***v.t.*** سەرلەنوێ لێكۆڵینەوە؛ پیاچوونەوە.
***n.*** دووبارە لێكۆڵینەوە؛ پیاچوونەوە.
**resuscitate** (ri-sus′ə-tāt´), ***v.t.*** هەناسە هێنەرەوەبەر؛ هۆش هێنانەوەبەر ( پاش لە هۆش خۆ چوون).
***v.i.*** هەناسە هاتنەوەبەر؛ هۆش هاتنەوە بە بەردا.
**resuscitation** (ri-sus´ə-tā′shən), ***n.*** هۆش هێنانەوەبەر (پاش لە هۆش خۆ چوون یا بوورانەوە)؛ هۆش هێنانەوەبەر؛ هەناسەپێدانەوە.
**resucitator** (ri-sus′ə-tā´tẽr), ***n.*** هۆش هێنەرەوەبەر ( ئامێر، مرۆڤ)؛ هەناسەپێدەرەوە.
**ret** (ret), ***v.t.*** خۆشەكردن؛ خووساندن ( بۆ جیاكردنەوەی ڕیشاڵی ڕووەكی كوش لە قەدەكەی).
**retable** (ri-tā′b'l), ***n.*** ڕەفەی پشت قوربانیگا ( بۆ شت لەسەر دانان).

**retail** (rē′tāl), *n.* ووردەفرۆشی؛ تاکفرۆشی.

*adj.* هی ووردەفرۆشی: *( The ~ price is a dollar.)* .

*v.t.* (١) ووردەفرۆشی کردن؛ تاکفرۆشی کردن.

(٢) گێرانەوە ( چیرۆك، دەنگوباس).

*v.i.* بە تاك فرۆشران: *( These books ~ at a dollar.)* .

**retailer** (rē′tāl-ēr, ri-tāl′ēr), *n.* ووردەفرۆش؛ تاکفرۆش؛ دانەفرۆش.

**retain** (ri-tān′), *v.t.* (١) گلدانەوە بۆ خۆ؛ بۆ خۆ هێشتنەوە؛ هێلانەوە.

(٢) لە بارێك یا دۆخێكدا هێشتنەوە.

(٣) بەردەوام بوون لە کردن یا بەکارهێناندا.

(٤) لەبیرمان؛ لەبیر نەچوونەوە؛ لە مێشکدا مانەوە:

*( to ~ information, knowledge, etc.)*

(٥) گرتن ( پارێزەر)؛ ڕاگرتن بە پارە: *( to ~ a lawyer)* .

(٦) ڕاگرتن ( کارەکەر، بەردەست).

**retainer** (ri-tān′ēr), *n.* (١) هێلەرەوە ( مرۆڤ، شت).

(٢) پیاوی دەرەبەگێك، خانزادەیەك، یا سەرگەورەی خێڵێك.

(٣) (ا) کەمەربەست؛ بەردەستی ناومالّ؛ کارەکەر. (ب) مووچەخۆر؛ کرێکار.

(٤) درزێك یا ڕێرەوێكە کە شتێکی تێدا دەخولێتەوەو تێدا ڕادەگیرێ.

**retainer** (ri-tān′ēr), *n.* (١) گرتن ( پارێزەر، ڕاوێژکار)؛ ڕاگرتن بەکرێ.

(٢) مزی پارێزەر

**retaining wall,** دیواری بەربەستکەر ( لە پەنا گردی هەرەس بردوودا).

**retainment** (ri-tān′mənt), *n.* هێشتنەوە؛ گلدانەوە؛ هێلرانەوە؛ مانەوە

**retake** (rē-tāk′), *v.t.* (١) گرتنەوە ( شوێنی داگیرکراو)؛ گەڕاندنەوە بۆ خۆ: *( to ~ a captured town)* .

(٢) وێنەگرتنەوە.

*n.* (١) گرتنەوە؛ سەندنەوە. (٢) وێنەی دووبارە گیراو.

**retaliate** (ri-tal′i-āt′), *v.i. & v.t.* تۆلەکردنەوە؛ تۆلەسەندنەوە.

**retaliation** (ri-tal′i-ā′shən), *n.* تۆلە؛ تۆلەکردنەوە؛ تۆلەسەندنەوە.

**retaliatory** (ri-tal′i-ə-tôr′i, ri-tal′i-ə-tō′ri), *adj.* تایبەتی بە تۆلەکردنەوە.

**retard** (ri-tärd′), *v.t.* دواخستن؛ پاش خستن؛ هێواش کردنەوە؛ کۆسپ لەبەردەمدا دانان: *( to ~ progress)* .

*v.i.* دواکەوتن؛ هێواش بوونەوە

*n.* دواکەوتن

**retardate** (rē′tär-dā′t), *n.* کەسێکی مێشك ناتەواو؛ کەسێکی بە زگماکی بێ مێشك.

**retardation** (rē′tär-dā′shən), *n.* (١) دواخستن؛ هێواش کردنەوە؛ پاش خستن. (٢) دواخران. (٣) کۆسپ؛ شتی دواخەر. (ب) ماوەی دواخستن.

(٤) هێواش کردنەوە ( مۆسیقا).

(٥) مێشك ناتەواوی؛ کەودەنی؛ بێ مێشکی بە زگماکی.

**retarded** (rē′tär-did′), *adj.* مێشك ناتەواو؛ کەودەن؛ بێ مێشك بە زگماکی

**retch** (rech), *v.i.* هێلنج هێنان؛ ڕشانەوە

**rete** (rē′tē), *n.* تۆڕی دەزوولە خوێن یا هەستە دەمار

**retene** (rē′tēn, ret′ēn), *n.* ڕاتین: هایدرۆکاربۆنێکی بلووریە ( کیمیا)

**retention** (ri-ten′shən), *n.* (١) هێشتنەوە؛ گلدانەوە.

(٢) هێلرانەوە؛ مانەوە لە لەشدا ( وەك میزو شتی تر).

(٣) (ا) لەبیرمان؛ لەبیر نەچوونەوە؛ لەبیرمانەوە *( ~ of information)* .

(ب) توانای لەبیرمان یا لەبیر نەچوونەوە.

**retentive** (ri-ten′tiv), *adj.* (١) هێلەرەوە؛ توانای هێشتنەوە هەبوون.

(٢) بیرتیژ؛ شت لەبیرنەچوو؛ تیژ ( بیر): *( a ~ memory)*

**retentivity** (rē′ten-tiv′ə-ti), *n.* (١) هێزی هێلانەوە یا مانەوە

(٢) مانەوەی موگناتیسێتی پاش بڕینی سەرچاوەی موگناتیسی کردنەکە.

**retiary** (rē′shi-er′i), *adj.* (١) تەونی؛ تایبەتی بە تەون یا تۆڕ.

(٢) تەون دروستکەر ( وەك جاڵجاڵۆکە).

**reticence** (ret′ə-s'ns), *n.* بێ دەنگی؛ کەم دوویی؛ نەدوویی؛ دەم نووقاوی.

**reticency** (ret′ə-s'n-si), *n.* = **reticence.**

**reticent** (ret′ə-s'nt), *adj.* کەم دوو؛ نەدوو؛ بێ دەنگ؛ دەم نووقاو.

**-reticently** *(adv.).*

**reticle** (ret′i-k'l), *n.* تۆڕی وورده تەلی تەلیسکۆپو ئامێری بینینی تره.

**reticular** (ri-tik′yoo-lēr), *adj.* (١) لە تۆڕ یا تەون دەچێت.

(٢) ئالۆز؛ ئالۆسکاو.

**reticulate** (ri-tik′yoo-lit), *adj.* تەون ئاسا:

*( ~ veins of a leaf)*

*v.t.* وەك تۆڕ یا تەون دروستکردن؛ وەك تۆڕ لێکردن.

*v.i.* وەك تۆڕ یا تەون لێهاتن.

**reticulation** (ri-tik′yoo-lā′shən), *n.* تۆڕ؛ تەون.

**reticule** (ret′i-kūl′), *n.* (١) جانتای تۆڕ ئاسایی دەستی ژنانە.

(٢) **reticle**.

**reticulum** (ri-tik′yoo-ləm), *n.* (١) تۆڕ؛ تەون.

(٢) [R-]، ناوی کۆ ئەستێرەیەکە. (٣) شانەی تۆڕ ئاسایی ( زیندەوەرزانی)

(٤) دووەم گەدەی گیانداری کاوێژکەر.

**retiform** (rē′ti-fôrm′, ret′i-fôrm′), *adj.* تەون ئاسایی؛ وەك تۆڕ.

**retina** (ret′'n-ə, ret′i-nə), *n.* تۆڕی چاو؛ تۆڕینە.

**-retinal** *(adj.).*

**retinitis** (ret′'n-ī′tis, ret′i-nī′tis), *n.* هەوکردنی تۆڕی چاو.

**retino-, retin-** (ret′'n-ə), پێشگرێکە بەمانای: تۆڕی چاو.

**retinoscope** (ret′'n-ə-skōp′, ret′i-nə-skōp′), *n.* ئامێری تێڕوانینی تۆڕی چاو ( پزیشکەوانی).

( هەروەها پێشی دەوترێ: "skiascope ").

**retinoscopy** (ret′'n-os′kə-pi, ret′i-nos′kə-pi), *n.* تێڕوانین یا پشکنینی تۆڕی چاو ( پزیشکەوانی). ( هەروەها "skiascopy").

**-retinoscopic** *(adj.).*

**retinue** (ret′'n-ōō, ret′i-nū′), *n.* دەستوپێوەند.

**retire** (ri-tir′), *v.i.* (١) خۆکشانەوە بۆ شوێنێکی پەناو بێ دەنگ؛ چوون بۆ حەوانەوە. (٢) چوونە جێگا؛ نوستن: *( to ~ to the bedroom)* .

(٣) کشانەوە ( جەنگ).

(٤) خۆ خانەنشین کردن؛ خۆ لێ خستن؛ لێکەوتن؛ دەست لەئیش هەلگرتن بەهۆی پیرییەوە: *( He ~d from teaching last year.)* .

*v.t.* (١) کشاندنەوە؛ کێشانەوە؛ کێشانە دواوە:

*( to ~ the troops from an action)*

(٢) کێشانەوە لە بازاڕ ( وەك پارە).

(٣) خانەنشین کردن؛ لێ خستن؛ دەست پێ هەلگرتن لە ئیش:

*( They ~d several generals.)*

**retired** (ri-tīrd′), *adj.* (١) گۆشەگیر؛ لاتەریك: *( a ~ life)* .

(٢) خانەنشین؛ لێکەوتوو؛ نیشتەماڵ؛ ماڵ نشین: *( a ~ officer)* .

(٣) هی خانەنشین؛ هی ماڵ نشینان: *( ~ pay)* .

(٤) کشاوە.

**retirement** (ri-tīr′mənt), *n.* (١) خۆکشانەوە.

(٢) خانەنشینی؛ لێکەوتن؛ ماڵ نشینی. (٣) گۆشەگیری؛ لاتەریکی؛ تەنهایی.

(٤) پەنا؛ کونجی بێ دەنگ؛ پەناگا.

**retiring** (ri-tīr′iŋ), *adj.* گۆشەگیر؛ لاتەریك؛ شەرمن؛ نەدوو؛ بێ دەنگ.

**retook** (rē-took′), *past tense of* **retake.**

**retool** (rē-tool′), *v.t. & v.i.* (١) تازەکردنەوەی ئامێرو مەکینەی کارخانە ( بۆ دروستکردنی شتی جیا).

(٢) ڕێکخستنەوە؛ سەرلەنوێ ڕێکخستن.

**retort** (ri-tôrt′), *v.t.* (١) دانەوە ( خراپە، جوێن، بەدگۆیی)؛ کردنەوە بەرامبەر (بەتایبەتی کاری خراپ):
*( to ~ an affront upon a person)*
(٢) بەرپەرچدانەوە؛ وەلامی ڕەق دانەوە.
*v.i.* بەرپەرچدانەوە؛ وەلامی ڕەق دانەوە؛ وەلامی کوتوپڕ دانەوە (بەتایبەتی وەلامێکی ڕەق و زیرەکانە).
*n.* بەرپەرچ؛ بەرپەرچدانەوە؛ وەلامی کوتوپڕو ڕەق و زیرەکانە.
**retort** (ri-tôrt′), *n.* شووشەی مل خوار ( کیمیا).
**retortion** (ri-tôr′shən), *n.* (١) چەماندنەوە بە پشتدا؛ بەپشتدا وەرگەڕان.
(٢) تۆلەکردنەوە ( بەتایبەتی لە هاوولاتیانی ووڵاتێکی تر لەلایەن میرییەوە).
**retouch** (rē-tuch′), *v.t.* (١) دەستکاری کردن بۆ چاك کردن ( تابلۆ، نووسراو، پەیکەر). (٢) چاك کردنی جام یا وێنە بە دەستکاری کردنی ( وێنەگەری)
*n.* (١) دەستکاری کردن بۆ چاك کردن.
(٢) شتێکی زیادکراو یا لابراو لەم دەستکاری کردنەدا.
(٣) وێنەیەکی دەستکاری کراوو چاك کراو.
**retrace** (ri-trās′), *v.t.* (١) پاشەوپاش گەڕانەوە:
*( He ~d his steps.)*
(٢) پیاچوونەوە لە سەرەتاوە ( بە چیرۆکێکدا).
(٣) پیاچوونەوە لە مێشکدا یا بەچاو.
**retrace** (rē′trās′), *v.t.* بەسەر هێڵەکانیدا چوونەوە ( وێنە، نەخشە).
**retract** (ri-trakt′), *v.t. & v.i.* (١) کشاندنە دواوە یا ناوەوە؛ کێشانەوە *( A snail can ~ its horns.)*.
(٢) کێشانەوە؛ پاشگەز بوونەوە: *( to ~ a statement, offer, etc.)*.
**-retractable; retractible** *(adj.)*.
**retractile** (ri-trak′t'l), *adj.* (١) دەتوانرێ بکشێنرێتەوە؛ دەکشێتەوە:
*( Cats have ~ claws.)*
(٢) هی کشانەوە: *( ~ power)*.
**-rectractility** *(n.)*.
**retraction** (ri-trak′shən), *n.* (١) کشانە دواوە یا ناوەوە؛ کێشانەوە؛ کێشرانەوە (٢) کێشانەوە (ووتە، بەڵێن)؛ پاشگەزبوونەوە.
(٣) توانای کشانەوە.
**retractive** (ri-trak′tiv), *adj.* کێشەرەوە؛ تایبەتی بە کێشانە دواوە یا ناوەوە.
**retractor** (ri-trak′tēr), *n.* (١) کێشەرەوە؛ ماسولکەی ئەندامی لەش کێشەرەوە. (٢) ئامێری ڕاکێشانی ئەملاو ئەولای برین لەکاتی نەشتەرکاریدا بۆ هێشتنەوەی بە کراوەیی.
**retral** (rē′trəl), *adj.* (١) هی پشتەوە یا دواوەی لەش.
(٢) بۆ دواوە؛ بۆ پشتەوە
**retread** (rē′tred′), *v.t.* لاستیکی تازە تێگرتنی تایەی ئوتومبیل.
*n.* تایەی لاستیکی تازە تێگیراو.
**retread** (rē-tred′), *v.t.* پێدا ڕۆیشتنەوە ( ڕێ، ڕێبان):
*( to ~ a path)*
**retreat** (ri-trēt′), *n.* (١) کشانە دواوە؛ کشانەوە؛ گەڕانە دواوە؛ بەزین؛ پاشەوپاش گەڕانە دواوە. (٢) کشانەوە بۆ پەناگا یا کونجی حەوانەوە.
(٣) پەناگا؛ پەنا؛ قەلەندەرگا؛ جێی خۆشاردنەوە.
(٤) ماوەی بەسەربراو لە پەناگایەکدا (بەتایبەتی بۆ خواپەرستن یا بیرکردنەوە).
(٥) لانە (بۆ شێت و سەرخۆش و نەخۆش... هتد)؛ شێتخانە.
(٦) (أ) کشانەوە ( لەشکر)؛ تێکشکان؛ بە زۆر کشانەوە؛ بەزین و کشانەوە.
(ب) نیشانەی ئەم کشانەوەیەی لەشکر.
(ج) دەنگی تەپڵ یا کەڕەنا لە ئێواراندا بۆ ئالا داگرتن.
(د) ئاهەنگی ئەم ئالا داگرتنە.
*v.i.* (١) کشانەوە (لەشکر)؛ تێکشکان: *( The army ~d.)*.
(٢) بە دوادا چوون ( چەناگە، ناوچەوان)؛ بە پشتدا کەوتن.
*v.t.* گەڕانەوە یا کشاندنەوەی داشی شەترەنج.
**beat a retreat,** (١) فەرمانی لەشکر کشانەوە دان بە تەپڵ یا کەڕەنا لێدان.
(٢) کشانەوە؛ ڕاکردن؛ بەزین و کشانەوە.
(٣) دەست هەڵگرتن لەکارێك؛ دەست لێ بەرداربوون.
**retrench** (ri-trench′), *v.t.* (١) کەمکردنەوە ( خەرجی)؛ دەست بەپارەوە گرتن (٢) لێ لابردن ( بەشی پەرتووك یا ووتارێك)؛ لێ برین یا کردنەوە.
*v.i.* کەمتر خەرج کردن؛ دەست بە پارەوە گرتن.
**retrenchment** (ri-trench′mənt), *n.* (١) خەرجی کەمکردنەوە؛ دەست بە خۆوە گرتن. (٢) سەنگەری دواوە یا دووەم ڕیز؛ خەنەقی پشتەوە
**retribution** (ret′rə-bū′shən), *n.* (١) (ا) سزای ڕەوا؛ تۆلە.
(ب) پاداشت.
(٢) پاداشتی ئەوەو دنیا ( هی کاری خراپ یا باش).
**retributive** (ri-trib′yoo-tiv), *adj. Also* **retributory,** هی سزای ڕەوا؛ هی پاداشتی کاری خراپ یا چاك.
**retrievable** (ri-trēv′ə-b'l), *adj.* دەهێنرێتەوە؛ دەگەڕێنرێتەوە؛ دەسەنرێتەوە؛ دەست دەکەوێتەوە
**retrieval** (ri-trēv′'l), *n.* (١) سەندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ هێنانەوە؛ دەست کەوتنەوە؛ هاتنەوەبیر. (٢) لەوانەبوونی هێنانەوە بۆ لای خۆ، دەست کەوتنەوە، یا بیرکەوتنەوە: *( beyond ~ )*.
**retrieve** (ri-trēv′), *v.t.* (١) سەندنەوە؛ دەست کەوتنەوە؛ هێنانەوە؛ گەڕاندنەوە بۆلای خۆ. (٢) بووژاندنەوە؛ تازەکردنەوە؛ بۆ گەڕانەوە:
*( He ~d his spirits.)*
(٣) ڕاستکردنەوە ( هەڵە)؛ چاك کردن؛ بژاردن.
(٤) بیرکەوتنەوە؛ هاتنەوەبیر.
(٥) دۆزینەوەی نێچیری بریندارکراو یا کوژراو و هێنانەوەی بۆلای ڕاوچی (تانجی و سەگی ڕاو).
*v.i.* دۆزینەوەی نێچیری بریندارکراو یا کوژراو و هێنانەوەی بۆلای ڕاوچی (تانجی و سەگی ڕاو).
**retriever** (ri-trēv′ēr), *n.* (١) هێنەرەوە؛ سەندەرەوە؛ گەڕێنەرەوە بۆ خۆ. (٢) سەگی نێچیرهێنەرەوە: جۆرە سەگێکی ڕاوە نێچیری بریندارکراو یا کوژراو دەدۆزێتەوەو دەیهێنێتەوە بۆ لای ڕاوچییەکە.
**retro-** (ret′rō), پێشگرێکە بەمانای: بۆ دواوە؛ پشتەوە؛ بەرەودوا:
( retroactive)
**retroact** (ret′rō-akt′), *v.i.* (١) بەرپەرچی کار دانەوە
(٢) کارکردنەسەر ڕووداوی ڕابوردوو ( یاسا)؛ بۆ دوایشەوە کارکردن
**retroaction** (ret′rō-ak′shən), *n.* (١) بەرپەرچی کار دانەوە.
(٢) کارتێکردنی یاسا بۆسەر ئەو شتانەی پێش دەرچوونی یاساکە ڕوویداوە.
**retroactive** (ret′rō-ak′tiv), *adj.* ئەو شتانەش دەگرێتەوە کە پێش دەرچوونی یاساکە ڕوویداوە؛ بەرەو دوایش کارکەر:
*( a ~ law or agreement)*
-retroactive.
**retroactively** (ret′rō-ak′tiv-li), *adv.* بە جۆرێك کە ئەو شتانەش بگرێتەوە کە لەوەوپێش ڕوویداوە ( یاسا): *( The law applies ~ .)*
**retrocede** (ret′rō-sēd′), *v.i.* گەڕانە دواوە؛ کشانەوە.
*v.t.* پێدانەوە؛ بۆ گەڕاندنەوە.
**retrocession** (ret′rō-sesh′ən), *n.* (١) گەڕانە دواوە؛ کشانەوە.
(٢) پێدانەوە؛ بۆ گەڕاندنەوە.
**retroflex** (ret′rə-fleks′), *adj.* (١) بە دوادا نوشتاوەتەوە؛ بە پشتدا چەماوەتەوە. (٢) بە لێدانی سەری زمان لە ئاسمانەی دەم دەبێژرێ ( دەنگناسی).
**-retroflexed** *(adj.)*; **retroflexion** ; **retroflection** *(n.)*.
**retrogradation** (ret′rō-grā-dā′shən), *n.* (١) کشانەوە؛ بۆ دواوە گەڕانەوە؛ پاشەوپاش ڕۆیشتن. (٢) دانەدواوە؛ نشوستی هێنان؛ بەناخداچوون؛ بەرەو نەمان چوون.

**retrograde** (ret′rə-grād′), ***adj.*** (١) گەڕاوە؛ بۆ دواوە چوو؛ کشاوە.
***( a ~ motion)***
(٢) هەڵگەڕاوە؛ بەپێچەوانە ( ڕێز)؛ پاش‌وپێش خراو.
(٣) بۆ دۆخی جاران‌و خراپتر دەگەڕێتەوە؛ دەداتە دواوە؛ هەتا بێت خراپتر دەبێ.
(٤) بە پێچەوانەی زەمینەوە دەسووڕێتەوە ( ئەستێرەناسی).
(٥) [Obs.]، دژ.
***v.i.*** (١) گەڕانەوە؛ بۆ دواوە چوون.
(٢) دانەدواوە ( ڕەووشت، توانا)؛ خراپتربوون؛ نشوستی هێنان؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران‌و خراپتر.
(٣) بە پێچەوانەی زەمینەوە سووڕانەوە ( ئەستێرەناسی).
**retrogress** (ret′rə-gres′), ***v.i.*** (١) دانەدواوە؛ بەرەو خراپی چوون؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی جاران‌و خراپتر. (٢) گەڕانەوە؛ کشانەوە؛ گەڕانە دواوە.
**retrogression** (ret′rə-gresh′ən), ***n.*** (١) نشوستی هێنان؛ دانەدواوە؛ بەرەو خراپی ڕۆیشتن؛ بەناخداچوون.
(٢) گەڕانەوە بۆ دۆخی سەرەتایی‌و کەم ئاڵۆزی ( زیندەوەرزانی).
**retrogressive** (ret′rə-gres′iv), ***adj.*** لە بەناخدا چووندایە؛ لە نشوستیدایە؛ بەرەو خراپی ڕۆیشتوو؛ نیشانەی گەڕانەوەی پێوە دیارە بۆ دۆخی سەرەتایی.
**retrorse** (ri-trôrs′), ***adj.*** نوشتاوەتەوە بۆ دواوە یا خوارەوە؛ چەماوە.
**retrospect** (ret′rə-spekt′), ***n.*** بیر لە شتی ڕابووردوو کردنەوە؛ یادکردنەوەی ڕووداوی ڕابوردوو.
***v.i. & v.t.*** [Rare], بیر لەشتی ڕابوردوو کردنەوە؛ یادی ڕابوردوو کردنەوە.
**in retrospect,** کە سەیری ڕابوردوو دەکەیت یا لێی دەکۆڵیتەوە؛ ئەگەر بە چاوی ئێستە سەیری ڕابوردوو بکەیت.
**retrospection** (ret′rə-spek′shən), ***n.*** بیرکردنەوە لە شتی ڕابوردوو؛ یادکردنەوەی ڕابوردوو.
**retrospective** (ret′rə-spek′tiv), ***adj.*** (١) سەیری ڕابوردوو کەر؛ لە ڕابوردوو کۆڵەرەوە؛ هی تێڕوانینی ڕابوردوو. (٢) سەیری دواوەکەر؛ ئاراستەی پشتەوە کراو. (٣) retroactive.
(٤) تایبەتی بە پێشانگایەکە کە بەرهەمی ڕابوردووی هونەرمەندێک پیشان دەدات: ***( a ~ exhibit)***.
***n.*** پێشانگەیەکە کە بەرهەمی ڕابوردووی هونەرمەندێک پیشان دەدات.
**retrousse** (ret′rōō-sā′), ***adj.*** قنج ( لووت)؛ سەرەکەی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ سەرەوە ( لووت).
**retroversion** (ret′rə-vūr′zhən, ret′rə-vūr′shən), ***n.*** (١) بە پشتدا خوارکردنەوە؛ بە دوادا کەوتن یا لاربوونەوە.
(٢) بە پشتدا خواربوونەوە؛ بە پشتدا چوون یا کەوتن.
**retry** (rē-trī′), ***v.t.*** دووبارە دادپرسین؛ دادپرسینەوە.
**retsina** (ret′si-nə), ***n.*** ڕێتسینا جۆرە شەرابێکی یۆنانییە.
**rettery** (ret′ə-ri), ***n.*** جێی خۆشەکردن یا خووساندنی ڕووەکی گوش بۆ جیاکردنەوەی ڕیشاڵەکان لە قەدی ڕووەکەکە.
**return** (ri-tūrn′), ***v.i.*** (١) گەڕانەوە؛ هاتنەوە؛ ڕۆیشتنەوە.
(٢) گەڕانەوە سەر ( باس، بیر): ***( Let's ~ to the subject.)***.
(٣) گەڕانەوە بۆ خاوەنی پێشوو. (٤) وەڵام دانەوە.
***v.t.*** (١) گەڕاندنەوە؛ ناردنەوە؛ هێنانەوە؛ بۆ گەڕاندنەوە؛ هاووردنەوە؛ خستنەوە جێی خۆی. (٢) دانەوە (چاکە، دیەدنی):
***( to ~ a favor; to ~ a visit)***
(٣) بەرهەم بوون؛ بەروبووم هەبوون؛ بەرگرتن.
(٤) ڕاپۆردان؛ بڵاوکردنەوە.
(٥) هەڵبژاردنەوە ( نوێنەری پەرلەمان)؛ گەڕاندنەوە بۆ پەرلەمان.
(٦) چەك خستنەوە کیفەکەی.
(٧) پاشەوپاش گەڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە بۆ دواوە.
(٨) لێدانەوە ( تۆپی باڵە یا تەنس)؛ گەڕاندنەوە.
***n.*** (١) گەڕانەوە؛ هاتنەوە؛ ڕۆیشتنەوە.
(٢) گەڕاندنەوە؛ هێنانەوە؛ ناردنەوە. (٣) شتی گەڕێنراوە یا نێرراوە.
(٤) ڕووداوەوە؛ دووبارەبوونەوە؛ گەڕانەوە:
***( On his birthday they wished him many happy ~s of the day.)***
(٥) چاکە دانەوە؛ خراپە دانەوە؛ چاکە؛ پاداشت.
(٦) (ا) قازانج یا دەسکەوتی ئاڵوگۆڕییەك.
(ب) (pl.)، قازانج؛ دەسکەوت. (ج) دەسکەوت یا قازانجی دانەیەك.
(٧) (ا) پێچ ( دیوار، ڕێگە، هێڵ...هتد). (ب) ماوە یا شتی نێوان دوو پێچ.
(٨) وەڵام. (٩) ڕاپۆر: (ا) ڕاپۆری باری دارایی کۆمپانیایەك.
(ب) (pl.)، ڕاپۆری ئەنجامی هەڵبژاردن: ***( election ~s)***.
(١٠) (ا) گەڕاندنەوەی فەرمانێکی دادگا لەلایەن کەسێکەوە پاش مۆرکردنی.
(ب) ڕاپۆری مۆرکراو لەلایەن کاربەدەستی هەڵبژاردن یا باجەوە.
(١١) (ا) لێدانەوەی تۆپی تەنس یا باڵە؛ گەڕاندنەوەی تۆپێکی وەها.
(ب) تۆپی گەڕێنراوە.
***adj.*** (١) هی گەڕانەوە ( بلیت)؛ هی چوون‌و هاتنەوە: ***( a ~ ticket)***.
(٢) لە ئەنجامی کارێکی بەرامبەردا کراو: ***( a ~ visit)***.
(٣) گەڕاوە. (٤) گەڕێنراوە؛ نێرراوە؛ هێنراوە.
**in return,** بەرامبەر بە؛ لە پاداشتدا.
**returnable** (ri-tūr′nə-b′l), ***adj.*** (١) دەگەڕێنرێتەوە ( فرۆتەنی).
(٢) پێویستە یا دەبێ بگەڕێنرێتەوە.
**return ticket,** (١) بلیتی گەڕانەوە.
(٢) بلیتی هەردووسەر؛ بلیتی دووسەرە.
**retuse** (ri-tōōs′, ri-tūs′), ***adj.*** سەرەکەی خڕە یا کولەو نەختێکی کەلە (گەلا).
**retype** (rē-tīp′), ***v.t.*** دووبارە چاپ کردن؛ چاپ کردنەوە.
**reunify** (rē-ū′nə-fī′), ***v.t.*** یەك پێکرتنەوە؛ یەکگرتنەوە؛ کردنەوە بە یەك.
**-reunification** ***(n.).***
**reunion** (rē-ūn′yən), ***n.*** (١) یەك پێکرتنەوە؛ کردنەوە بە یەك؛ یەکگرتنەوە؛ بوونەوە بە یەك. (٢) بەیەککەیشتنەوە (بەتایبەتی هی خێزانێك یا دەرچووانی پۆلی قوتابخانەیەك پاش ماوەیەکی زۆر)؛ بە یەك شادبوونەوە:
***( a family ~ ; a class ~ )***
**reunionist** (rē-ūn′yən-ist), ***n.*** یەکگرتن خوازی کڵێسەی ئینگلیزی‌و کاسۆلیکی.
**reunite** (rē′yoo-nīt′), ***v.t.*** یەك پێکرتنەوە؛ کردنەوە بە یەك.
***v.i.*** یەکگرتنەوە؛ بوونەوە بە یەك.
**rev** (rev), ***n.*** [Colloq.], خولانەوەی مەکینە.
***v.t.*** [Colloq.], بین پێدان ( مەکینە)؛ بەنزین زۆر پێدان‌و خێرا خولاندنەوە؛ بین پێ گرتن: ***( ~ the engine up.)***.
***v.i.*** [Colloq.], بین گرتن؛ خێرا خولانەوە.
**Rev. = Reverend.**
**revalue** (rē-val′ū), ***v.t.*** نرخی تازەی بەرزتر دانان بۆ پارە.
**-revaluation** ***(n.).***
**revamp** (rē-vamp′), ***v.t.*** (١) چاك کردنەوە؛ تازەکردنەوە؛ پینەکردن.
(٢) پێڵاو پینەکردن. (٣) بژارەکردن؛ دارشتنەوە.
**revanchism** (rē-van′chi-z′m), ***n.*** سەندنەوەی شوێنی داگیرکراو لەلایەن وولاتی دووژمنەوە.
**reveal** (ri-vēl′), ***v.t.*** (١) دەرخستن؛ پیشاندان؛ خستنەڕوو.
(٢) درکاندن؛ ئاشکراکردن: ***( to ~ a secret)***.
**reveille** (rev′ə-li), ***n.*** (١) کەڕەنا یا تەپڵی سەرباز لە خەو هەڵسان.
(٢) یەکەم ڕیزبوونی بەیانیان.
**revel** (rev′′l), ***v.i.*** (١) بەزم‌وڕەزم گێڕان؛ ڕابواردن؛ زەماوەند گێڕان؛ خۆش ڕابواردن. (٢) خۆشی لێ بینین؛ زۆر حەزلێکردن:
***( He ~s in sports.)***
***n.*** بەزم‌وڕەزم؛ زەماوەند؛ ئاهەنگ؛ ڕابواردن.
**revelation** (rev′ə-lā′shən), ***n.*** (١) درکاندن؛ ئاشکراکردن ( نهێنی).

(۲) شتی ئاشکراکراو یا درکێنراو.
(۳) (ا) خۆ ئاشکراکردنی خوداو نەخشەکانی بۆ ئادەمیزاد.
(ب) ئەوەی ئاشکراکراوە.
(ج) ئینجیس ( کە مەبەستو نەخشەکانی خودای تێدا ئاشکراکراوە).
(٤) [R-] دوانەمشی ئینجیل.

**reveler; reveller** (rev′'l-ēr), *n.* بەزم گێر: زەماوەندکەر؛ ئاهەنگکەر

**revelry** (rev′'l-ri), *n.* بەزمورەزم؛ زەماوەند؛ ئاهەنگ؛ کەیفو سەما.

**revenant** (rev′ə-nənt), *n.* (۱) کەسێکی گەڕاوە پاش ماوەیەکی زۆر.
(۲) خێو؛ گیانی گەڕاوەی مردوو.

**revenge** (ri-venj′), *v.t.* تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵەسەندن.
*n.* (۱) تۆڵە. (۲) تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵەسەندن.
(۳) حەز لە تۆڵەسەندنەوە کردن؛ کینە لەدڵی.
**be revenged,** تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵەسەندن.

**revengeful** (ri-venj′fəl), *adj.* حەزکەر لە تۆڵەسەندنەوە؛ کینە لەدڵ؛ رق هەڵگر.

**revenue** (rev′ə-nōō′, rev′ə-nū′), *n.* (۱) داهات؛ بەروبووم؛ موڵکانە: دەسکەوت. (۲) سەرچاوەی داهات.
(۳) داهاتی باجو گومرگو شتی وەهای میری.
(٤) دەزگای داهات کۆکردنەوەی میری.

**reverberant** (ri-vûr′bēr-ənt), *adj.* دەنگدەرەوە

**reverberate** (ri-vûr′bə-rāt′), *v.t.* (۱) دەنگدانەوە؛ زرنگانەوە.
(۲) شەوقدانەوە؛ گەرمی دانەوە.
*v.i.* (۱) دەنگدانەوە؛ زرنگانەوە. (۲) شەوقدانەوە؛ گەرمی دانەوە.
(۳) گەڕانە دواوە؛ هەڵبەزینەوە.
**-reverberative** *(adj.)*; **reverberator** *(n.)*.

**reverberation** (ri-vûr′bə-rā′shən), *n.* (۱) (ا) دەنگدانەوە؛ زرنگانەوە. (ب) شەوقدانەوە؛ گەرمی دانەوە.
(۲) دەنگی دراوە؛ زرنگە؛ شەوقی دراوە.

**reverberatory** (ri-vûr′bēr-ə-tôr′i), *adj.* (۱) دراوە (دەنگ. گەرمی). (۲) تایبەتی بە دەنگدانەوە یا گەرمی دانەوە.
(۳) تایبەتی‌یە بە کورەیەك کە کانزای خاوی تێدا دەتوێنرێتەوە بەهۆی ئەو گەرمی‌یەی بنمیچی کورەکە دەیداتەوە.
*n.* کوورەی تواندنەوەی کانزای خاو بەهۆی گەرمای بنمیچی کوورەکە.

**revere** (ri-vêr′), *v.t.* زۆر رێزگرتن؛ پەرستن.
*( They ~ their parents.; to ~ a saint)*

**revere** (ri-vêr′), *n.* = revers.

**reverence** (rev′ēr-əns), *n.* (۱) رێزێکی زۆر؛ پەرستن.
(۲) نیشانەی رێزی ئێجگار زۆر یا پەرستن ( وەك کرنووش بردن).
(۳) رێزی زۆر گیران؛ پەرستن.
(٤) [R-]، بەرێز: نازناوی قەشەو سەرەك قەشەیە:
*( His ~ , the bishop ; your ~ )*
*v.t.* زۆر رێزگرتن؛ پەرستن.

**reverend** (rev′ēr-ənd), *adj.* (۱) [R-] : بەرێز: نازناوی قەشەو سەرەك قەشەیە *( ~ Jackson)* .
(۲) تایبەتی بە قەشەو سەرەك قەشەکان.
*n.* [Colloq.], قەشە.

**reverent** (rev′ēr-ənt), *adj.* زۆر بەرێز؛ بەرێز؛ رێزگر.

**reverential** (rev′ə-ren′shəl), *adj.* رێزگر؛ رێز پیشاندەر.
*( to be ~ toward somebody)*
**-reverentially** *(adv.)*.

**reverie** (rev′ēr-i), *n. Also* **revery,** (۱) زیندەخەو؛ زەرەخەو؛ دالغە.
*[ I was lost in (a) ~ .]*
(۲) خەیاڵ پلاوی؛ خۆ خەڵەتاندن؛ بیری ناکردەنی.
(۳) ئاوازێکی خۆش

**revers** (rə-vêr′, rə-vâr′), *n. Also* **revere,** یەخەی چاکەت (بەتایبەتی هی ژنانە).

**reversal** (ri-vûr′s'l), *n.* (۱) هەڵگەڕانەوە؛ پاشوپێش خستن؛ گۆڕینی بەرودوا. (۲) پاشوپێش خران.
(۳) پووچ کردنەوە یا هەڵگەڕانەوەی بڕیاری دادگایەك لەلایەن دادگایەکی بەرزترەوە.

**reverse** (ri-vûrs′), *adj.* (۱) وەرچەرخاو؛ پاشوپێش کراو؛ بەرودوا؛ ئاوەژوو؛ هەڵگەڕاوە. (۲) پێچەوانە؛ بە پێچەوانەی شێوەی ئاسایی‌یەوە
(۳) بۆ دواوە بەر ( گێڕی مەکینە)؛ بۆ دواوە بزوێن: *( a ~ gear)* .
*n.* (۱) پێچەوانە؛ دژ. (۲) پشتی پارە (کە پێی دەڵێن " خەت " ).
(۳) هەڵگەڕانەوە؛ وەرگەڕان؛ وەرچەرخان؛ ئاوەژوویی.
(٤) نشوستی؛ نەهاتی؛ تێکشکان.
(٥) (ا) گێڕی گەڕانەوە دواوەی ئوتومبیلو مەکینەی تر. (ب) باری ئەم گێڕە.
(٦) بزوانی پێچەوانە.
*v.t.* (۱) وەرگەڕاندن؛ وەرچەرخاندن؛ وەرگێڕان؛ گێڕانەوە.
(۲) ئاوەژووکردن؛ هەڵگەڕاندنەوە.
(۳) پاشوپێش خستن؛ ئاڵوگۆڕکردنی جێگە؛ بەرودواخستن.
(٤) گۆڕینی تەواو.
(٥) پووچ کردنەوە یا هەڵگەڕاندنەوەی بڕیارێك ( دادگەری).
*v.i.* (۱) وەرگەڕان؛ وەرچەرخان؛ پێچکردنەوەو بۆ دواوە رۆیشتن؛ گێڕانەوە؛ بە پێچەوانە رۆیشتن. (۲) گێڕی ئوتومبیلو مەکینەی تر؛ گۆڕین بۆ گێڕی گەڕانە دواوە.

**reversely** (ri-vûrs′li), *adv.* (۱) بە وەرگەڕاوی؛ بە وەرچەرخاوی؛ بە ئاوەژوویی؛ بە پاشوپێش خراوی. (۲) بە پێچەوانەی ئەوەوە؛ لەلایەك یا لە سەرێکی ترەوە.

**reversible** (ri-vûr′sə-b'l), *adj.* (۱) دوورووو (جلوبەرگ)؛ بە ئاوەژوویش لەبەر دەکرێ؛ بەروپشت دەکرێ.
(۲) هەڵدەگەڕێنرێتەوە؛ دەتوانرێ بگۆڕێ یا پووچ بکرێتەوە؛ وەردەگێڕێ.
(۳) شێوە یا بارەکەی دەگۆڕێت (فیزیا، کیمیا).
*n.* جلوبەرگی دوورووو (بلووس، کراس...هتد).
**-reversibility; reversibleness** *(n.)*; **reversibly** *(adv.)*.

**reversion** (ri-vûr′zhən, ri-vûr′shən), *n.* (۱) وەرگەڕان؛ وەرچەرخان. (۲) گەڕانەوە بۆ دۆخو بارو خوونەریتو بیروباوەڕی جاران.
(۳) (ا) گەڕانەوە بۆ دۆخ یا شێوەی سەرەتایی ( زیندەوەرزانی).
(ب) دەرکەوتنەوەی تایبەخۆی پێشینان لە نەوەی ئێستەدا.
(ج) زیندەوەرێك یا کەسێکە کە ئەم تایبەخۆی پێشینانەی تێدا دەرکەوێتەوە
(٤)[Obs.]، ماوە؛ پاشماوە.
(٥) (ا) گەڕانەوەی خانوو یا زەوی‌وزارێکی بەخشراو بۆ خاوەنەکەی جارانی و میراتبەرەکانی (ب) زەوی‌وزار یا خانوویەکی وەها .
(ج) مافی گەڕانەوەی خانو و زەوی‌وزارێکی وەها بۆ خاوەنەکەی یا بردنی لەلایەن میراتبەرەکانی‌یەوە.

**reversionary** (ri-vûr′zhən-er′i, ri-vûr′shən-er′i), *adj. Also* **reversional,** تایبەتی بە گەڕانەوەی خانو و زەوی‌وزارێکی بەخشراو بۆ خاوەنەکەی زووی.

**reversioner** (ri-vûr′zhən-ēr, ri-vûr′shən-ēr), *n.* ئەو کەسەی خانو و زەوی‌وزارێکی بەخشراوی بۆ دەگەڕێتەوە پاش تەواوبوونی ماوەی بەخشینەکە؛ میراتبەری ئەم کەسە.

**revert** (ri-vûrt′), *v.i.* (۱) گەڕانەوە بۆ دوخ یا باری جاران؛ گەڕانەوە بۆ خوو نەریتی جاران: *( to ~ to childhood)* .
(۲) (ا) گەڕانەوە بۆ دۆخی سەرەتایی ( زیندەوەرزانی).
(ب) تایبەخۆی پێشینانی لەوتاو تیا دەرکەوتنەوە.
(۳) گەڕانەوەی خانو و زەوی‌وزار یا پارە بۆ خاوەنەکەی جارانی یا بۆ میری
**-revertible** *(adj.)*.

**revery** (rev′ēr-i), *n.* = reverie.

**revest** (rē-vest′), *v.t.* پێدانەوە ( خانو و زەوی‌وزار، دەسەڵات،

پلەوپایە؛ بۆ گەڕاندنەوە؛ دامەزراندنەوە یا دانانەوە (لەسەر کار).
**revet** (ri-vet′), *v.t.* ڕاگرتن یا بەربەستکردنی کەندەڵانێك یا بەستوویەك
بە کەڵەکە بەرد، دیوار، یا چیمەنتۆ.
**revetment** (ri-vet′mənt), *n.* (١) کەڵەکە بەرد یا کیسە لمی
بەربەستکەری کەنەڵانێك یا شتێك؛ (٢) دیواری بەربەستکەر.
**review** (ri-vū′), *n.* (١) پیاچوونەوە؛ دووبارە لێکۆڵینەوە.
(٢) چاو پێداخشاندنێکی گشتی؛ ڕاپۆرتێکی گشتی:
*( a ~ of last year's events)*
(٣) بیرکردنەوە لە شتی ڕابوردوو؛ پیاچوونەوەی ڕووداوی ڕابوردوو.
(٤) پیاچوونەوەی بڕیاری دادگا: *( a ~ of a lower court's decision)*.
(٥) هەڵسەنگاندن یا شەنوکەوکردن (بەرهەمێکی هونەری، پەڕتووك،
شانۆنامە ...هتد)؛ وتاری هەڵسەنگێنەر یا شەنوکەوکەر؛ وتاری ڕەخنەیی:
*( A ~ of his book appeared in several papers and ~s )*
(٦) گۆڤاری ڕەخنەیی: گۆڤارێکە وتاری هەڵسەنگێنەر یا شەنوکەوکەری
پەڕتووك و بەرهەمی هونەری و شتی تازە دۆزراوەی تێدا بڵاودەکرێتەوە:
*( a literary ~ ; a scientific ~ )*
(٧) پیاچوونەوەی وانە: *( a ~ of a lesson, chapter, etc.)*.
(٨) revue.
(٩) تێڕوانینی خۆپیشاندانێکی سوپایی:
*( a ~ of the troops by the commander-in-chief)*
*v.t.* (١) پیاچوونەوە؛ دووبارە لێکۆڵینەوە.
(٢) سەیرکردن یا لێکۆڵینەوەی ڕابوردوو.
(٣) پیاچوونەوە لە مێشکدا.
(٤) تێڕوانینی خۆپیشاندانی سوپا: *( The general ~ed his troops.)*.
(٥) هەڵسەنگاندن (پەڕتووك، شانۆنامە، بەرهەمی هونەری ...هتد)؛
شەنوکەوکردن.
(٦) پیاچوونەوەی بڕیاری دادگا (لەلایەن دادگایەکی بەرزترەوە).
(٧) پیاچوونەوەی وانە: *( to ~ a lesson , chapter, etc.;*
*to ~ the material before the test)*
*v.i.* هەڵسەنگاندن (پەڕتووك، شانۆنامە ...هتد)؛ شەنوکەوکردن؛
وتاری ڕەخنەیی نووسین.
**reviewal** (ri-vū′əl), *n.* پیاچوونەوە؛ لێکۆڵینەوەی دووبارە.
**reviewer** (ri-vū′ēr), *n.* شەنوکەوکەر؛ هەڵسەنگێنەر (پەڕتووك،
شانۆنامە، بەرهەمی هونەری ...هتد)؛ نووسەری وتاری ڕەخنەیی بۆ
ڕۆژنامەوگۆڤار.
**revile** (ri-vīl′), *v.t.* جوێن پێدان؛ جنێو پێدان؛ سووك کردن؛
قسەی خراپ پێ وتن.
*v.i.* جوێن دان؛ جنێو دان.
**-reviler** *(n.)*.
**revilement** (ri-vīl′mənt), *n.* (١) جوێن پێدان؛ جنێودان؛
سووك کردن. (٢) جوێن؛ جنێو؛ قسەی سووك.
**revisal** (ri-vīz′′l), *n.* پیاچوونەوەو چاکردن؛ بژارەکردن؛ بژارەکران
**revise** (ri-vīz′), *v.t.* (١) پیاچوونەوەو ڕاستکردنەوە (دەستنووس)؛
بژارەکردن؛ پوختەکردن. (٢) گۆڕین؛ پیاچوونەوەو گۆڕین؛ دەستکاری کردن:
*( They ~d their estimates.)*
*n.* (١) بژارەکردن؛ بژارە؛ پیاچوونەوەو ڕاستکردنەوە؛ شتی بژارەکراو یا
ڕاستکراوە. (٢) شتێکی لەچاپدراو کە بژارە دەکرێتەوە بۆ دووەم جار.
**-reviser; revisor** *(n.)*.
**revised** (ri-vīzd′), *adj.* بژارەکراو؛ پوختەکراو؛ چاککراو:
*( a ~ edition)*
**revision** (ri-vizh′ən), *n.* (١) پیاچوونەوەو چاك کردن؛ پوختەکردن؛
بژارەکردن؛ ڕاستکردنەوە. (٢) وێنەی بژارەکراو یا پوختەکراو ( پەڕتووك،
دەستنووس)؛ وێنەی چاککراو یا ڕاستکراوەی نووسراوێك.
**-revisional ; revisionary** *(adj.)*.
**revisionism** (ri-vizh′ən-iz′m), *n.* دەستکاری کردن؛
بزووتنەوەی دەستکاری کردن و گۆڕین (بەتایبەتی هی ڕێبازی مارکسی-
لینینی لەلایەن هەندێك لە کۆمیونیستەکانەوە).
**revisionist** (ri-vizh′ən-ist), *n.* دەستکاریکەر یا چاککەر
(بەتایبەتی کۆمیونیستێك بۆ ڕێبازی مارکسی-لینینی).
*adj.* هی دەستکاریکەرانی ڕێبازی مارکسی-لینینی؛
تایبەتی بە دەستکاری کردنی ئەم ڕێبازە.
**revisit** (ri-vizit′), *v.t.* سەرلێدانەوە؛ دووبارە سەرلێدان.
*n.* سەرلێدانەوە.
**revisory** (ri-vī′zə-ri), *adj.* هی پیاچوونەوەو گۆڕین؛
دەسەڵاتی پیاچوونەوەو دەستکاری کردن پێدراو: *( a ~ committee)*.
**revitalize** (ri-vī′t'l-īz′), *v.t.* بووژاندنەوە؛ ژیاندنەوە؛
زیندووکردنەوە.
**-revitalization** *(n.)*.
**revival** (ri-vi′v'l), *n.* (١) بووژاندنەوە؛ ژیاندنەوە؛ زیندووکردنەوە.
(٢) بووژانەوە؛ ژیانەوە؛ زیندووبوونەوە؛ بزووتنەوە:
*( the ~ of an old custom)*
(٣) پێشکەش کردنێکی تازە پاش یەکەم پێشکەش کردن یا نواندن بە
ماوەیەکی زۆر (شانۆنامە، فیلم): *( a ~ of his play, film, etc.)*.
(٤) هەناسە هاتنەوەبەر؛ هاتنەوە هۆش خۆ؛ هۆش هێنانەوەبەر؛ ژیاندنەوە.
(٥) بزووتنەوەی هەستی ئاینی.
(٦) کۆبوونەوەیەك یا چەند کۆبوونەوەیەکی جەماوەری بۆ بزووتنەوەی
هەستی ئاینی: *( to hold a ~ )*.
**revivalism** (ri-vīv′′l-iz′m), *n.* بزووتنەوەی هەستی ئاینی.
**revivalist** (ri-vīv′′l-ist), *n.* (١) بانگ بۆ هەڵدەری بزووتنەوەی
هەستی ئاینی. (٢) بووژێنەرەوە یا زیندووکەرەوەی خوونەریت و بیروباوەڕی
کۆن.
**revive** (ri-vīv′), *v.i.* (١) بووژانەوە؛ زیندووبوونەوە؛ ژیانەوە؛
گەش بوونەوە: *( Flowers ~ in water.)*.
(٢) هاتنەوە هۆش خۆ؛ هۆش هاتنەوەبەر؛ هەناسە هاتنەوەبەر؛ زیندووبوونەوە
(٣) تازەبوونەوە؛ بووژانەوە: *( Our hopes ~d.)*.
(٤) باو پەیداکردنەوە؛ بزووتنەوە؛ گەشەکردن: *( customs which ~ )*.
*v.t.* (١) بووژاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ ژیاندنەوە.
(٢) هۆش هێنانەوەبەر؛ هێنانەوە هۆش خۆ؛ هەناسە هێنانەوەبەر.
(٣) پەرە پێ سەندن؛ برەوپێدان؛ گەشەپێکردن.
(٤) باو پێ پەیداکردنەوە؛ زیندووکردنەوە (خوونەریتی کۆن).
(٥) خستنەوە مێشك؛ هێنانەوە بیر.
(٦) پیشاندان یا نواندن پاش ماوەیەکی زۆر دوای یەکەم پیشاندان
(شانۆنامە، فیلم): *( to ~ a play)*.
**revivify** (ri-viv′ə-fī′), *v.t.* بووژاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛
گەشەپێدان؛ ژیاندنەوە.
**-revivification** *(n.)*.
**reviviscence** (rev′ə-vis′′ns), *n. Also* **reviviscency**, گەش
بوونەوە؛ بووژانەوە؛ تازەبوونەوە؛ زیندووبوونەوە.
**-reviviscent** *(adj.)*
**revocable** (rev′ə-kə-b'l), *adj. Also* **revokable**, پووچ
دەکرێتەوە؛ هەڵدەوەشێنرێتەوە.
**-revocability** *(n.)*.
**revocation** (rev′ə-kā′shən), *n.* پووچ کردنەوە؛ هەڵوەشاندنەوە
( یاسا، قۆنتەرات): *( the ~ of a contract, law, etc.)*.
**revokable** (rev′ə-kə-b'l), *adj.* = **revocable.**
**revoke** (ri-vōk′), *v.t.* هەڵوەشاندنەوە ( یاسا، قۆنتەرات؛ پەیمان،
ماف)؛ پووچ کردنەوە: *( to ~ a license, contract,etc.)*
*v.i.* یاری نەکردن لە کاتێکدا کە یاریکەر وەرەقەی باشی پێ بێت بۆ یاری کردن
(قومارو یاری کاغەز).
*n.* یاری نەکردنی یاریکەر هەرچی چەند وەرەقەی باشی پێ بێت بۆ یاری کردن.

**revolt** (ri-vōlt′), *n.* شۆڕش: یاخی بوون.
*v.i.* (١) شۆڕش گێران؛ شۆڕش کردن؛ یاخی بوون:
*( The people ~ed against their rulers.)*
(٢) دڵ لێ تێکەڵهاتن؛ قێزلێهاتنەوە؛ بێزلێهاتنەوە؛ زۆر پێ پەست بوون:
[ *Human nature ~s at (from, against) such a crime.* ]
*v.t.* دڵ تێکەڵهێنان؛ زۆر پەستکردن؛ قێزلێکردنەوە:
*( The scene ~ed him.)*
**revolting** (ri-vōl′tiŋ), *adj.* (١) لە شۆڕشدایە؛ شۆڕشگێڕ؛ یاخی.
(٢) پیس؛ بۆگەن؛ دڵ تێکەڵهێنەر: *( a ~ act, behavior, scene, etc.)*.
**revolute** (rev′ə-lōōt′, rev′ə-lūt′), *adj.* نوشتاوەتەوە بە پشتدا یا بۆ خوارەوە ( وەك سەرو قەراغی هەندێ گەڵا).
**revolution** (rev′ə-lōō′shən, rev′ə-lū′shən), *n.* (١) خولانەوە؛ سووڕانەوەی زەمین و ئەستێرەکان. (٢) ماوەی سووڕانەوەیەك یا خولانەوەیەکی ئەستێرەی گەڕۆك. (٣) خولانەوە (مەکینەکاری)؛ سووڕانەوە.
(٤) خول؛ سووڕ؛ چەرخە.
(٥) گۆڕینێکی تەواو: *( a ~ in modern Physics)*.
(٦) شۆڕش.
**revolutionary** (rev′ə-lōō′shən-er′i, rev′ə-lū′shən-er′i),
*adj.* (١) شۆڕشگێڕ؛ شۆڕشگێڕانە. (٢) خولاوە؛ سووڕاوە.
*n.* شۆڕشگێڕ؛ کەسێکی شۆڕشگێڕ.
**revolutionist** (rev′ə-lōō′shən-ist, rev′ə-lū′shən-ist), *n.* شۆڕشگێڕ.
**revolutionize** (rev′ə-lōō′shən-īz′, rev′ə-lū′shən-īz′),
*v.t.* (١) لە ڕەگەوە گۆڕین؛ بە تەواوی گۆڕین؛ زۆر گۆڕین:
*( The automobile has ~d American life.)*
(٢) [Rare]. شۆڕش گێران؛ شۆڕش کردن؛ هەڵگێڕانەوەی ڕژێمی وڵات.
**revolve** (ri-volv′), *v.t.* (١) بیرلێکردنەوە.
(٢) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە؛ چەرخاندنەوە.
*v.i.* (١) خولانەوە؛ سووڕانەوە؛ چەرخانەوە:
*( The earth ~s around the sun.)*
(٢) دوا بەدوای یەك هاتن و چوون؛ یەك لەدوای یەك هاتن و چوون؛ نۆبەکردن:
*( the ~ing seasons)*
**revolver** (ri-vol′vēr), *n.* (١) دەمانچەی بەکرەدار؛ شەش تیر.
(٢) خولاوە ( مرۆڤ، شت).
**revolving** (ri-vol′viŋ), *adj.* خولاوە؛ سووڕاوە؛ چەرخاوە.
**revolving door,** دەرگای خولاوە؛ دەرگای سووڕاوە.
**revolving fund,** پارەیەکە دانراوە بۆ بە قەرزدان ( لەلایەن بانقەوە)، وە هەر کە قەرزێك درایەوە پارەکە دەخرێتەوە شوێنی خۆی وە هەروەها.
**revue** (ri-vū′), *n.* نواندنی لاقرتێیی: پیشاندانێکی لاقرتێیانەی سەر شانۆیە بریتی‌یە لە مۆسیقا و گۆرانی و سەما و گفتوگۆ بۆ گاڵتەکردن بە باو و ڕووداو و خوونەریتی ئەو سەردەمە.
**revulsion** (ri-vul′shən), *n.* (١) کشانە دواوە؛ خۆ لێ کشانەوە؛ لێ دوورکەوتنەوە. (٢) (ا) گۆڕینێکی کوتوپڕی و تەواوی هەست.
(ب) قین لێ بوونەوە؛ قێزلێهاتنەوە؛ دڵ لێ تێکەڵهاتن (بەتایبەتی لە ڕقدا).
(٣) چاك کردنەوەی ئەندامێکی نەخۆشی لەش بە دەرمان کردنی ئەندامێکی تر.
**revulsive** (ri-vul′siv), *adj.* هی دەرمانی چاککەرەوەی ئەندامێکی نەخۆشی لەش بە چارەکردنی ئەندامێکی تر.
*n.* دەرمانێکی وەها.
**reward** (ri-wôrd′), *n.* پاداشت؛ خەڵات؛ بەخشیش.
*v.t.* پاداشت دانەوە؛ خەڵات کردن؛ بەخشیش پێدان.
**rewire** (rē-wīr′), *v.t. & v.i.* (١) تەلی کارەبای تازە لێدان یا تێخستن (خانوو، مەکینە). (٢) برووسکە ناردن دووبارە؛ برووسکە لێدانەوە.
**reword** (rē-wûrd′), *v.t.* (١) داڕشتنەوە؛ ووتنەوە یا نووسینەوە بە ووشەی جیا: *( to ~ a sentece, statement, etc.)*.
(٢) دووبارەکردنەوە (بە هەمان ووشە)؛ دووپاتکردنەوە.

**rewirte** (rē-rīt′), *v.t. & v.i.* (١) نووسینەوە؛ سەرلەنوێ نووسینەوە.
(٢) داڕشتنەوە و نووسینەوە بە شێوەیەکی جیا؛ دەستکاری کردن و نووسینەوە:
*( to ~ a paper, article, etc.)*
(٣) داڕشتنەوەی دەنگوباسی وەرگیراو بە شێوەیەك کە بۆ بڵاوکردنەوە بشێت (ڕۆژنامەگەری).
*n.* ووتارێکی سەرلەنوێ داڕێژراو.
**Rex** (reks), *n.* پاشا؛ شا.
**rezone** (rē-zōn′), *v.t.* سنووری تازە دانان بۆ گەڕەکەکانی ناوچەیەك یا شارێك.
**rhabdomancy** (rab′də-man′si), *n.* دۆزینەوەی ئاو و کانزای ژێرزەمین بە داری خەمڵ لێدان.
**rhapsodic** (rap-sod′ik), *adj. Also* **rhapsodical,** لە ئەندازە بەدەر بەجۆش ( نووسراو، ووتار، دووان).
**-rhapsodically** *(adv.)*.
**rhapsodist** (rap′sə-dist), *n.* (١) خوێنەرەوەی داستان بە دەنگی بەرز (لە یۆنانی کۆندا). (٢) نووسەر یا گفتوگۆکەری زۆر بەجۆش.
**rhapsodize** (rap′sə-dīz′), *v.i.* هەستی خۆ دەربڕین زۆر بەجۆش لە نووسین یا گفتوگۆدا وەك دێوانە.
*v.t.* زۆر بەجۆشەوە و بە دەنگی بەرز خوێندنەوەی داستان و هەڵبەست.
**rhapsody** (rap′sə-di), *n.* (١) داستانێك یا بەشێکی داستانێکی بە دەنگی بەرز خوێنراوە لە یۆنانی کۆندا. (٢) داستان یا هەڵبەستێکی تازەی بەجۆشی بە دەنگی بەرز خوێنراوە. (٣) بەجۆشەوە هەستی خۆ دەربڕین لە نووسین و گفتوگۆدا؛ نووسین و گفتوگۆی زۆر بەجۆش.
(٤) پارچەیەك مۆسیقای بەجۆشی سەرپێیی و لەسەر شێوازێکی تایبەتی دانەنراو.
**go into rhapsodese over,** هەستی بەجۆش و گەشکەیی خۆ دەربڕین.
**rhatany** (rat′ə-ni), *n.* (١) جۆرە گیایەکی پزیشکی‌یە.
(٢) ڕەگی ووشك کراوەی ئەم ڕووەکە.
**rhea** (rē′ə), *n.* ووشترمری ئەمەریکای خواروو: جۆرە ووشترمرێکی بچووکە توانای فڕینی نی‌یە و لەباتی دوو پەنجە سیانی هەیە.
**rheo-** (rē′ō, rē′ə), پێشگرێکە بەمانای: تەووژم؛ تەزوو ( **rheostat** ).
**rheology** (ri-ol′ə-ji), *n.* زانستی لێکۆڵینەوەی تەووژم و شێوە گۆڕینی ماددە.
**rheometer** (ri-om′ə-tēr), *n.* ئامێری پێوانی تەووژمی کارەبا یا خوێن.
**rheoscope** (rē′ə-skōp′), *n.* ئامێری تاقیکردنەوەی بوون و نەبوونی تەزووی کارەبا.
**rheostat** (rē′ə-stat′), *n.* ئامێری ڕێکخستنی هێزی تەزووی کارەبا.
**rhesus** (rē′səs), *n. Also* **rhesus monkey,** جۆرە مەیموونێکی کلك کورتی قارەیی هیندی‌یە.
**rhetor** (rē′tēr, rē′tôr), *n.* (١) مامۆستای ڕەوانبێژی.
(٢) ڕەوانبێژ؛ ووتاربێژ.
**rhetoric** (ret′ə-rik), *n.* (١) هونەری ڕەوانبێژی؛ هونەری زمانپاراوی.
(٢) پەرتووکێك یا باسێك دەربارەی ڕەوانبێژی. (٣) هونەری ووتاربێژی.
(٤) پەخشان؛ پەخشان نووسین.
(٥) زیادەڕۆیی و پێ لێ هەڵبڕین و زۆر ڕازاوەیی زمان لە نووسین و دووواندا؛ قسەی زل و بۆش.
**rhetorical** (ri-tôr′i-k'l, ri-tor′i-k'l), *adj.* (١) تایبەتی بە ڕەوانبێژی؛ بەپێی ڕەوانبێژی یا زمانپاراوی. (٢) زیاتر بە تەنگ ڕووالەت و زیادەڕۆیی و کارکردنەسەر خەڵکەوە دێت لە ناوەڕۆك و ڕاستی قسە (نووسین، دووان، ووتاربێژی)؛ ڕازاوە و بۆش ( زمان): *( a ~ statement)*.
**-rhetorically** *(adv.)*.
**rhetorical question,** پرسیارێکە کە چاوەڕوانی وەڵام نی‌یە؛ پرسیارێکە کە دەکرێت تەنها بۆ کارکردنەسەر گوێگر نەك بۆ وەڵام وەرگرتن
**rhetorician** (ret′ə-rish′ən), *n.* (١) مامۆستای ڕەوانبێژی؛

زانای رەوانبێژی. (٢) نووسەر یا ووتاربێژێکی زمانپاراو؛ رەوانبێژ.
(٣) کەسێکە کە حەز لە قسەی زل دەکات؛ قسە زل؛ زیادەڕۆ لە گفتوگۆدا.

**rheum** (rōōm), *n.* (١) چڵم، فرمێسك؛ لیك. (٢) هەڵامەت.

**rheumatic** (rōō-mat'ik), *adj.* (١) رۆماتیزمی، هی باداری.
(٢) بادار، با تێداو؛ رۆماتیزمی هەیە؛ رۆماتیزمی تووش بووە.
*n.* (١) کەسێکی بادار؛ کەسێکە رۆماتیزمی تووش بووبێت.
(٢) *pl.* [Colloq.]، ئێش و ئازاری باداری.

**rheumatic fever,** تای رۆماتیزمی.

**rheumatism** (rōō'mə-tiz'm), *n.* (١) باداری؛ رۆماتیزم؛
سووتانەوەی جومگە. (٢) rheumatic fever.

**rheumatoid** (rōō'mə-toid'), *adj. Also* **rheumatoidal,** (١)
رۆماتیزمی؛ لەباداری دەچێت؛ هی باداری.
(٢) بادار، نەخۆشی رۆماتیزمی هەیە.

**rheumatoid arthritis,** جومگە سووتانەوە؛ باداری درێژخایەن.

**rhin-** (rīn), = rhino.

**rhinal** (rī'n'l), *adj.* تایبەتی بە لووت.

**rhinencephalon** (rī'nen-sef'ə-lon'), *n.* بەشی هەستی
بۆن کردن لە مێشکدا.

**rhinestone** (rīn'stōn'), *n.* بەردی راین. بەردێکی دەستکردی
بریقەدارە لە شووشە درووست دەکرێ لاسایی ئەڵماسی پێ دەکرێتەوە.

**rhinitis** (rī-nī'tis), *n.* سووتانەوەی لووت (بەتایبەتی هی پەردەی
ناوەوە)

**rhino** (rī'nō), *n.* [Colloq.], = rhinoceros.

**rhino-** (rī'nō, rī'nə), *Also* **rhin-,** پێشگرێکە بەمانای: لووت.

**rhinoceros** (rī-nos'ēr-əs), *n.* کەرکەدەن، یەکەنەشاخ.

**rhinology** (rī-nol'ə-ji), *n.* زانستی لووت و نەخۆشییەکانی.

**rhinoplasty** (rī'nə-plas'ti), *n.* نەشتەرکاری لووت جوانکردن.

**rhinoscope** (rī'nə-skōp'), *n.* ئامێری تێروانینی لووت.

**rhinoscopy** (rī-nos'kə-pi), *n.* تێروانینی لووت (پزیشکەوانی).

**rhizo-** (rī'zō, rī'zə), *Also* **rhiz-,** پێشگرێکە بەمانای: رەگ:
**(rhizopod)**

**rhizobium** (rī-zō'bi-əm), *n.* جۆرە بەکتریایەکە لە شیش دەچێ.

**rhizogenic** (rī'zə-jen'ik), *adj.* رەگ لێ پەیدابوو (وەك هەندێ
شانە)

**rhizogenous** (rī-zoj'ə-nəs), *adj.* = rhizogenic.

**rhizoid** (rī'zoid), *adj.* لە رەگ دەچێ
*n.* ئەندامی دەزوولەیی لە رەگ چووی قەوزە (کە بەهۆیەوە دەنووسێ بە بەرد و
شتی ترەوە).

**-rhizoidal** *(adj.).*

**rhizomatous** (rī-zom'ə-təs, rī-zō'mə-təs), *adj.* قەدی ناو
ناو زەوی یا بەسەر زەوییەوەی لە رەگ چووی هەیە.

**rhizome** (rī'zōm), *n.* قەدی ناو زەوی یا بەسەر زەوییەوەی رووەکێك
کە لە رەگ دەچێت.

**rhizomorphous** (rī'zə-môr'fəs), *adj.* لە رەگ دەچێ

**rhizophagous** (rī-zof'ə-gəs), *adj.* بە رەگ ژیاو.

**rhizopod** (rī'zə-pod'), *n.* زیندەوەری قاچ رەگی یەك شانەیی.

**-rhizopodan; rhizopodous** *(adj.).*

**rhizopus** (rī'zə-pəs), *n.* کەرووی لەرەگ چوو (کە کەرووی نانیش
دەگرێتەوە

**rhizotomy** (rī-zot'ə-mi), *n.* برینی رەگی: دەماری بربڕاگە لەبەر
ئازار ( نەشتەرکاری).

**rhodium** (rō'di-əm), *n.* رۆدیوم. کانزایەکی سپی زیوییە

**rhodo-** (rō'dō, rō'də), *Also* **rhod-,** پێشگرێکە بەمانای گوڵ؛
سوورە وەك گوڵ ( **rhodolite** )

**rhodochrosite** (rō'də-krō'sīt), *n.* بەردەپەمەیی.

**rhododendron** (rō'ə-den'drən), *n.* جۆرە دەوەنێکی هەمیشە
سەوزە گوڵی رەنگاوڕەنگ دەگرێت.

**rhodolite** (rō'də-līt'), *n.* رۆدۆلیت: جۆرە بەردێکی بەنرخی سوور یا
پەمەییە.

**rhodonite** (rō'də-nīt'), *n.* رۆدۆنیت: جۆرە کانزایەکی شووشەیی
بلووری پەمەیی یا سوورە بۆ جوانی بەکاردەهێنرێت.

**rhodora** (rō-dôr'ə, rō-dō'rə), *n.* جۆرە دەوەنێکی ئەمەریکی گوڵ
ئەرخەوانییە.

**rhomb** (romb, rom), *n.* = **rhombus.**

**rhombencephalon** (rom'ben-sef'ə-lon'), *n.* بەشی
پشتەوەی مێشك. ( پێشی دەووتری " **hindbrain** ".)

**rhombic** (rom'bik), *adj. Also* **rhombical,** لەبزینەیی
( ئەندازە).

**rhombohedron** (rom'bə-hē'drən), *n.* ئاوێزەی شەش
گۆشەیی ( ئەندازە).

**-rhombohedral** *(adj.).*

**rhomboid** (rom'boid), *n.* وێنەی لەبزینەیی.
*adj.* لەبزینەیی ( ئەندازە).

**-rhomboidal** *(adj.).*

**rhombus** (rom'bəs), *n.* لەبزینە ( ئەندازە).

**rhonchus** (roŋ'kəs), *n.* خیزەی سنگ؛ خیزەخیز.

**-rhonchal ; rhonchial** *(adj.).*

**rhubarb** (rōō'bärb), *n.* (١) ڕێواس.
(٢) [Slang]، مشتومڕ؛ دەمەقاڵێ؛ کێش مەکێش.

**rhumb** (rum, rumb), *n.* (١) یەکێك لە پلەکانی قیبلەنمای
کەشتییەوان. (٢) **rhumb line**.

**rhumba** (rum'bə), *n.* = **rumba.**

**rhumb line,** ڕێڕەوی کەشتی.

**rhyme** (rīm), *n.* (١) هاوکێشەیی یا هاودەنگی دوا ووشەی دێڕی
هۆنراوە؛ کێش. (٢) هاوکێشەیی پارچە هۆنراوەیەك یا هەڵبەستێك.
(٣) هۆنراوەی هاوکێشە.
(٤) ووشەی دوا دەنگ لەیەکچوو: *( love, above ; witty, pretty)*
*v.i.* (١) دەنگ لەیەکچوون؛ هاوکێشەبوون:
*("More" ~s with "door" .)*
(٢) هەڵبەستی هاوکێشە نووسین؛ بەکارهێنانی هاوکێشەیی یا هاودەنگی
دوا ووشەی دێڕ لە هۆنراوەدا.
*v.t.* (١) هاوکێشە کردن ( هۆنراوە)؛ هاودەنگ کردن.
(٢) بەکارهێنانی ووشەی هاوکێشە یا هاودەنگ.
**without rhyme or reason,** بێ مانا؛ هیچ وپووچ و بێ مانا؛
ناچێ بە مێشکدا؛ نابەجێ.

**rhymer** (rīm'ēr), *n. Also* **rimer,** دانەری هۆنراوەی هاوکێشە
(لەڕووی سووکییەوە)؛ گەنگە هۆنەر.

**rhyme scheme,** نەخشەی کێشی هۆنراوە.

**rhymester** (rīm'stēr), *n. Also* **rimester,** گەنگە هۆنەر؛
بوێژی هیچ وپووچ.

**rhynchocephalian** (riŋ'kō-sə-fā'li-ən), *adj.* تایبەتی بە
گیاندارێکی خشۆکی قرتێکەوتوو.
*n.* یەکێك لەم گیاندارە خشۆکە قرتێکەوتووانە.

**rhyolite** (rī'ə-līt'), *n.* بەردێکی ئاگرپژێنییە لە گرانیت دەچێت.

**rhythm** (rith'm, rith'əm), *n.* (١) ڕێك وپێکی؛ بە ڕێك وپێکی
ڕوودان و ڕوودانەوە: *( the ~ of speech, of the heart, of an engine, of dancing, of the seasons, etc.)*
(٢) پێکەوە گونجانی هەموو بەشەکانی بەرهەمێکی هونەری:
*( the ~ of a picture, a statue, a building, etc.)*
(٣) هاوئاوازی؛ ئەزمی مۆسیقا.

(٤) (١) كێش ( هۆنراوە)؛ ڕێكوپێكی یا نەزمی هۆنراوە.
(ب) جۆرە كێشێكی تایبەتی هۆنراوە.
**rhythmical** (ri*th*′mi-k'l), *adj. Also* **rhythmic,** هاوناواز؛ كێشدار (هۆنراوە)؛ نەزمدار؛ پێكەوە سازاو یا گونجاو؛ ڕێكوپێك.
**-rhythmically** *(adv.).*
**rhythmics** (ri*th*′miks), *n.pl.* زانستی نەزمی هۆنراوە؛ زانستی هاوناوازی یا نەزمی مۆسیقا.
**rhyt**ʰ**mist** (ri*th*′mist), *n.* كەسێكی گوێ سووك بۆ نەزمی هۆنراوەو مۆسیقا.
**rhythm m**ᵕ**thod,** ڕێگەیەكە بۆ سكپڕ نەبوون بریتی‌یە لە جووت نەبوون لەو كاتانەدا كە هێلكە ئامادەیە بۆ چاكبوونو سكپڕبوون.
**rialto** (ri-al′tō), *n.* (١) بازاڕ.
(٢) [R-]، گەڕەكی شانۆی شاری نیویۆرك (وە هەندێك جار شاری تریش).
**riant** (rī′ənt), *adj.* دەم بە پێكەنین؛ دڵشاد؛ ڕووخۆش.
**rib** (rib), *n.* (١) پەراسوو؛ ئێسقانی پەراسوو. (٢) پەراسوویەك گۆشت.
(٣) هاوسەر؛ ژن؛ خێزان؛ ژنی مێرددار. (٤) تیرە یا بەرزایی قوماشی چنراو.
(٥) پەراسوو ( كەشتی، باڵی فڕۆكە، چەتر)؛ تیرە.
(٦) دەستەكی تاق ( خانووسازی). (٧) دەماری سەرەكی گەڵا.
*v.t.* (١) قایم كردن یا داگرتنەوە بە پارچەیەكی پەراسوویی.
(٢) پارچەی پەراسوویی تێخستن.
(٣) [Slang]، گاڵتەپێكردن؛ لاقرتێ پێكردن
**ribald** (rib′əld), *adj.* زمان پیس؛ بێ ئابڕوو (قسە، زمان).
*n.* كەسێكی زمان پیس.
**ribaldry** (rib′əld-ri), *n.* زمان پیسی؛ قسەی پیس.
**riband** (rib′ənd, rib′ən), *n.* [Archaic], شریتی جوانی.
**ribband** (rib′band´, rib′ənd, rib′ən), *n.* تەختەدار یا ئاسنێكی درێژە بەكاردەهێنرێت بۆ چەسپاندنی پەراسووەكانی كەشتی لەكاتی درووستكردنیدا.
**ribbing** (rib′iŋ), *n.* (١) پەراسوو بە كشتی
(٢) جۆری ڕێكخستنی پەراسوو یا تیرە ( وەك لە بەلەمێكدا).
(٣) [Slang]، گاڵتە؛ لاقرتێ.
**ribbon** (rib′ən), *n.* (١) (ا) شریتی جوانی یا ڕازاندنەوە.
(ب) شریتی شت پێ بەستنەوە
(٢) (*pl.*) . تاڵ (جلی دڕاو)؛ شیتاڵ: *( a garment torn to ~s)*
(٣) شریتی ئامێری چاپ كردن.
(٤) (ا) شریتی ڕەنگاوڕەنگی خەڵات ( كە دەدرێت لە سنگ یا قۆڵ بۆ شانازی).
(ب) شریتی مەدالیای سوپا ( كە دەدرێت لە سنگ).
(٥) (*pl.*) . [Colloq.]، جلەو
*v.t.* (١) بە شریت ڕازاندنەوە. (٢) شیتاڵ شیتاڵ كردن.
**ribbonfish** (rib′ən-fish´), *n.* ماسی‌یە شریتی.
**riboflavin** (rī´bə-flā′vin), *n.* ڕیبۆفلەیڤن: ڤیتامینێكە لە شیرو هێلكەو جگەرو میوەو سەوزەدا هەیە.
**rib cage,** قەفەزەی سنگ.
**ribgrass** (rib-gras′), *n.* ڕووەكێكە گەڵاكەی لە ڕم دەچێت‌و لاسكەكانی گوڵی بچووكی سپی دەگرن.
**ribwort** (rib′wûrt´), *n.* = **ribgrass.**
**rice** (rīs), *n.* (١) مەرەزە (٢) برنج.
**rice-paddy** (rīs-pad′i), *n.* گۆلە مەرەزە؛ جاڕە مەرەزە.
**ricebird** (rīs′bûrd´), *n.* چۆلەكەی گۆلە مەرەزە.
**rice paper,** كاغەزی برنج: كاغەزێكی تەنكە لە گەڵای مەرەزە دروست دەكرێت.
**rich** (rich), *adj.* (١) زەنگین؛ دەوڵەمەند؛ سامانداز؛ پارەدار؛ دارا؛ سەرمایەدار؛ خۆش گوزەران.
(٢) سەرمایەی سرووشتی زۆرە: *( a ~ country)* .
(٣) پڕە لە؛ زۆری تێدایە: *( ~ in minerals)* .
(٤) بەنرخ؛ بە بایەخ: *( a ~ prize)* .
(٥) گرانبەها؛ گران: *( ~ gifts)* .
(٦) جوان‌و پارە زۆر تێچوو؛ نایاب؛ كەشخە: *( a ~ banquet)* .
(٧) (ا) چەور؛ زۆر شیرین؛ قورس: *( ~ foods, pastries, etc.)* .
(ب) خۆش‌و باش بوو: *( ~ wine)* .
(٨) (ا) پڕو بەهێز ( دەنگ): *( a ~ voice)* .
(ب) تێر ( ڕەنگ): *( ~ colors)* .
(ج) زۆر خۆش ( بۆن).
(٩) بەپیت ( خاك): *( a ~ soil)* .
(١٠) زەبەنە؛ زۆرو زەبەنە؛ بێ شومار.
(١١) [Colloq.]، سەیر؛ پێكەنیناوی.
**the rich,** دەوڵەمەندان؛ زەنگینان؛ سامانداران؛ پارەداران.
**-richness** *(n.).*
**riches** (rich′iz), *n.pl.* سامان؛ سەرمایە.
**richly** (rich′li), *adv.* (١) بە تێروتەسەلی؛ تێروتەسەلانە؛ دەوڵەمەندانە.
(٢) زۆر؛ بە تەواوی؛ ئێجگار زۆر: *( a punishment ~ deserved)* .
**rick** (rik), *n.* كوڕزەی گزرە ( بەتایبەتی كە خرابێتە ژێر چەرداخ یا ناو كایەنەوە بۆ باران لێ نەدان)؛ بەستەك.
**rickets** (rik′its), *n.* ئێسكەنەرمە (نەخۆشی)؛ گێڕی.
**rickety** (rik′i-ti), *adj.* (١) نەخۆشی ئێسكەنەرمەی هەیە؛ گێڕ؛ ئێسكەنەرمەدار. (٢) ئێسكەنەرمەیی؛ لە ئێسكەنەرمە دەچێت *( ~ diseases, symptoms, etc.)*
(٣) قرچۆك؛ شەق‌وشڕ؛ شلۆق: *( a ~ old house, tree, chair, etc.)* .
(٤) لاواز؛ بێ هێز؛ بێ تین: *( a ~ old man)* .
(٥) ناڕێكوپێك (بزووتنەوە، جووڵان).
**ricochet** (rik′ə-shā´, rik′ə-shet´), *n.* هەڵبەزینەوەو گەڕانەوەی گوللە پاش لێدانی ڕوویەكی تەخت؛ بەسەردا بازدان؛ بەسەردا هەڵبەزینەوە؛ بەسەردا تێپەڕبوون.
*v.i.* هەڵبەزینەوەو گەڕانەوەی گوللە پاش لێدانی ڕوویەكی تەخت؛ بەسەردا بازدان یا هەڵبەزینەوە: *( The bullet ~ed from the wall.)* .
**rictus** (rik′təs), *n.* (١) كونی دەمی مرۆڤ‌و گیاندارو دەنووكی باڵندە؛ دەم؛ بۆشایی دەم. (٢) درز؛ كەلێن؛ كەلەبەر؛ دەلاقە.
**rid** (rid), *v.t.* ڕزگاركردن؛ لێ ڕزگاركردن؛ لە كۆڵ كردنەوە؛ پاكردنەوە: *( to ~ oneself of debt; ~ yourself of superstitions.)*
**be rid of,** لێ ڕزگاربوون؛ لەكۆڵ بوونەوە: *( We will be glad to be rid of him.)*
**get rid of,** (١) خۆ لێ ڕزگاركردن؛ لە كۆڵ كردنەوە؛ دەست پێوەنان؛ لابردن؛ نەهێشتن: *( to get rid of red-tape, an unwelcome visitor, etc.)* .
(٢) سەرنگوم كردن؛ سەركردن بە گۆمدا؛ كوشتن؛ لەناوبردن.
**rid** (rid), *archaic past tense and p.p. of* **ride.**
**ridable** (rid′ə-b'l), *adj.* (١) بۆ سواربوون دەشێت؛ باشە بۆ سواربوون: *( a ~ horse)*
(٢) دەبڕدرێ ( ڕێگە)؛ بۆ پیاڕۆیشتن دەشێت: *( a ~ path)*
**riddance** (rid′'ns), *n.* خۆ لێ ڕزگاركردن؛ لێ ڕزگاربوون؛ لە كۆڵ كردنەوە.
**good riddance,** لەوە بەولاتر چی!؛ ئەوچاتر لە كۆڵمان بووەوە!؛ بابڕوا ملی بشكێت!.
**ridden** (rid′'n), *past participle of* **ride.**
*adj.* پڕە لە؛ پڕ؛ هەمووی گرتووەتەوە؛ لەژێر ڕكێفیدایە: *( fear- ~ ; disease- ~ ; grief- ~ )*
**riddle** (rid′'l), *n.* (١) مەتەڵ.
(٢) كەسێك یا شتێكی سەرسوڕمێنەرە كە لێ تێگەیشتنی گران بێت وەك مەتەڵ.
*v.t.* مەتەڵ هەڵهێنان.
*v.i.* مەتەڵ داهێنان؛ بە مەتەڵ قسەكردن، واتە بە ناڕوونی.
**riddle** (rid′'l), *n.* بێژنگی كون گەورە (بۆ بێژانەوەی چەو).

***v.t.*** (١) بیژانەوە؛ لە بێژنگ دان.
(٢) کون کون کردن؛ وەك بێژنگ لێکردن:
***( Bullets ~d the automobile.)***
(٣) ڕەخنەلێگرتن؛ کەموکووڕی تێدا دۆزینەوە.
**ride** (rīd), ***v.i.*** (١) سواربوون (ئەسپ، ئوتومبیل... هتد).
(٢) هەلگیران یا بران بە سواری شتێکەوە.
(٣) ڕۆیشتن لەسەر: ***( The automobile rode on the rims.)***
(٤) (أ) سەرناوکەوتن. (ب) لەنگەرگرتن.
(٥) بە ئاسماندا ڕۆیشتن وەك سەرناو کەوتبێ.
(٦) ڕۆیشتن ( ئوتومبیل، ئەسپ)؛ چۆنێتی ڕۆیشتن:
***( The car ~s smoothly.)***
(٧) چوونەسەرو لێ تێپەڕبوون؛ بەیەکداچوون.
(٨) [Slang]، وازلێهێنان؛ دەست تێوەنەدان:
***( I'll let the matter ~ a few months.)***
***v.t.*** (١) سوواربوون؛ لێخوڕین: ***( to ~ a horse, a bicycle, etc.)***
(٢) (أ) سواربوون: ***( The ship ~s the waves.; The child rode the merry-go-round.)***
(ب) خستنەسەر؛ لەسەر دانان؛ ڕاگیرکردن لەسەر.
(٣) بە ڕێگەیەك یا شوێنێکدا ڕۆیشتن (بە ئەسپ یا بە ئوتومبیل...هتد).
(٤) سوارکردن
(٥) بەشداربوون لە غارغارێن یا پێشبڕکێی ئوتومبیلدا:
***( He rode a race with me.)***
(٦) لەنگەرپێگرتن.
(٧) سواری سەر بوون؛ دەستبەسەرداگرتن: ***( ridden by doubts)***
(٨) [Colloq.]، گاڵتەپێکردن؛ لاقرتێ پێکردن؛ تیز پێوەکردن؛ پێ پێکەنین.
(٩) بە سەرپێیی دانان و دانەدەم ( مۆسیقای جاز).
***n.*** (١) گەشت (بە سواری ئەسپ، ئوتومبیل، پاسکیل)؛ چەرخە؛ سواربوون.
(٢) ڕێچکەی سواری؛ ڕێی وولاخ.
(٣) سواربوونێکی چەرخ و فەلەك و شتی وەها لە سەیرانگادا.
**go for a ride,** گەڕان (بە سواری ئوتومبیل یا ئەسپ)؛ چوون بۆ گەڕان یا گەشتێکی کورت
**ride down,** (١) لێدان و دان بەزەویدا (بە سواری).
(٢) گرتنەوە؛ پێ گەیشتنەوە. (٣) زاڵبوون بەسەردا؛ بەزاندن.
(٤) ڕەتاندن؛ زۆر ماندووکردنی ئەسپ.
**ride out,** (١) سەرناوکەوتن و بەرگەگرتنی زریان بەبێ زیانی زۆر.
(٢) بەرگەی ناخۆشی و نەهاتی گرتن؛ دەربردن لەکاتی کارەساتدا؛ هیچ لێ نەهاتن
**take for a ride, [Slang],** (١) بردن بە ئوتومبیل و کوشتن ( لەسەر شێوەی شەلاتی و چەتە)؛ بردن و سەرنگووم کردن
(٢) هەڵخەڵەتاندن؛ دەستبڕین.
**rider** (rīd'ẽr), ***n.*** (١) سوار (ئەسپ، پاسکیل، ماتۆڕسکیل)؛ ئەسپ سوار.
(٢) پاشکۆی بروانامە یا ڕاپۆرتێك.
(٣) بەندی خراوەسەر گەلاڵەی یاسا وەك پاشکۆ بۆ مۆرکردنی.
(٤) پارچەی بەستراو بە شتێکی ترەوە.
**ridge** (rij), ***n.*** (١) تیرەغەی پشتی وولاخ؛ پشتی گیاندار.
(٢) بەرزایی (شەپۆل، زەوی)؛ لووتکە؛ پۆپ؛ سەردێراو؛ بەرزەك.
(٣) تیغەشان؛ تیرەغە؛ لووتکە (شاخ. بەرد)؛ ناوڕێژان؛ قەراغ:
***( a mountain ~ )***
(٤) هێڵی قۆقز ( وەك هی سەر جل یا شتی تر).
(٥) تیرەغە یا شوێنی لێکدانی دوو دیوی سەربانی لێژ (خانووسازی ڕۆژئاوایی):
***( a ~ of a roof)***
***v.t. & v.i.*** لێکدان و تیرەغە لێ درووستکردن؛ وەك تیغەشان لێهاتن؛ هێڵی پۆپی پێکهێنان
**ridgepiece** (rij'pēs'), ***n.*** = ridgepole.
**ridgepole** (rij'pōl'), ***n.*** نیرگە ( لەسەربانی خانووی ڕۆژئاواییدا).

**ridicule** (rid'i-kūl'), ***n.*** لاقرتێ؛ گاڵتەپێکردن؛ گاڵتەکاری؛ پێ پێکەنین.
***v.t.*** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین؛ لاقرتێ پێکردن.
**ridiculous** (ri-dik'yoo-ləs), ***adj.*** بۆ پێکەنین باشە؛ بێ مانا؛ شایستەی لاقرتێیە؛ هیچ و پووچ.
**riding** (rīd'iŋ), ***adj.*** (١) سواربوو؛ سوار؛ ئەوەی سوار دەبێ.
(٢) بۆ سواربوون بەکاردەهێنرێت؛ هی سواری:
***( a ~ costume ; ~ horses)***
**riding crop,** قامچی ئەسپ سوار.
**riding habit,** بەرگی سواری (بەتایبەتی هی ئافرەت).
**riding school,** قوتابخانەی ئەسپ سواری
**rife** (rīf), ***adj.*** (١) بلاو؛ بە هەمووشوێنێکدا بلاوبووەتەوە؛ هەمووشوێنێکی گرتووەتەوە:
***( Disease is ~ among them.; Gossip was ~ .)***
(٢) زۆر؛ زەبەنە.
(٣) پڕە لە: ***( The report was ~ with error.)***
**riffle** (rif''l), ***n.*** (١) (أ) لێژایی ناو ڕووبار؛ تیرەبەردی ناو ڕووبار (کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی خوڕاو). (ب) خوڕاو؛ ڕێژاو؛ قەڵبەزە.
(٢) دەستە کاغەزی یاری و قومار تێکەڵاوکردن بە پەنجە گەورەی هەردوو دەست.
***v.t. & v.i.*** (١) بوون بە خوڕاو یا ڕێژاو.
(٢) هەڵدانەوەی پەڕەی پەرتووك خێرا خێرا بە پەنجە گەورە.
(٣) تێکەڵاوکردنی دەستە کاغەزی یاری و قومار بە پەنجە گەورەی هەردوو دەست.
**riffraff** (rif'raf'), ***n.*** (١) پووتەوپووتە؛ لات و لووت.
(٢) زبڵ؛ گەن و گوو؛ شتی بۆگەنی فڕێدراو.
**rifle** (rī'f'l), ***v.t.*** درزکردنی لوولەی تفەنگ.
***v.i.*** تفەنگ تەقاندن.
***n.*** (١) تفەنگ. (٢) (*pl.*) ، دەستە سەربازی تفەنگ لە شان.
**rifle** (rī'f'l), ***v.t.*** (١) تالان کردن.
(٢) پووتکردنەوە؛ پشکنین و پووتکردنەوە.
(٣) بڕین (ماڵ، خەزنە)؛ گسك لێدان: ***( to ~ a safe, house, etc.)***
(٤) دزین؛ تالان کردن.
**rifleman** (rī'f'l-mən), ***n.*** (١) سەربازی تفەنگدار یا تفەنگ لە شان.
(٢) تفەنگچی؛ نیشان شکێن.
**riflebird** (rī'f'l-bũrd'), ***n.*** باڵندەیەکە لە توخمی باڵندەی بەهەشت.
**rifle pit,** خەنەق یا سەنگەری تفەنگچی.
**rifler** (rī'flẽr), ***n.*** تالانکەر؛ دز؛ پووتکەرەوە؛ چەتە.
**rifle range,** (١) تفەنگ هاوێژ؛ ماوەی بڕکردنی گوللەی تفەنگ.
(٢) نیشانگا؛ مەیدانی تفەنگ تەقاندن.
**riflery** (rī'f'l-er'i), ***n.*** (١) تفەنگچێتی؛ نیشان شکێنی؛ دەست ڕاستی.
(٢) تەقەی تفەنگ: ***( the sound of distant ~ .)***
**rifling** (rī'fliŋ), ***n.*** (١) درزکردنی ناو لوولەی تفەنگ.
(٢) درزی ناو لوولەی تفەنگ.
**rift** (rift), ***n.*** (١) درز؛ قلیش؛ تلیش.
(٢) ناکۆکی؛ ناخۆشی نێوان دوو کەس، کۆمەڵ، یا وولات؛ ناڕێکی:
***( There is a ~ between them.)***
***v.i.*** شەق بردن؛ درزبردن؛ قلیش بردن؛ پچڕان؛ هەڵتلیشان.
***v.t.*** شەق پێ بردن؛ درز پێ بردن؛ قلیشاندن؛ هەڵتلیشاندن.
**rig** (rig), ***v.t.*** (١) بایەوان و کەرەسەی تر ئامادەکردن بۆ کەشتی و دانانی.
(٢) ئامادەکردن بە کەرەسە و هەمووشتەوە:
***( ~ged out and ready for action)***
(٣) ( ~ **up** )، بەپەلە ئامادەکردن.
(٤) [Colloq.]، جل لەبەرکردن؛ ڕازاندنەوە:
***( She was ~ged out in her best dress.)***
(٥) ساختەکردن؛ ئەنجامی پێشبڕکێیەك بڕیاردان پێشەکی بە ساختە:

***( to ~ an election; to ~ prices, a boxing match, etc.)***

***n.*** (١) شێوەی وەستان‌و ڕێکخستنی بایەوان‌و ستوونی کەشتی.
(٢) کەرەسە؛ کەرەسەی کار. (٣) کەرەسەی بیری نەوت هەڵکەندن.
(٤) گالیسکە (بە ئەسپەکانەوە). (٥) [Colloq.]، جلی سەیرو ئەنتیکە.

**rigamarole, = rigmarole.**

**rigger** (rig′ẽr), ***n.*** (١) کارگەی بایەوان‌و ستوون‌و کەرەسەی تری کەشتی (٢) کارگەی لێکدانی پارچەکانی باڵی فڕۆکەو پێکهێنانی.
(٣) کرێکاری سەر بەکرەو مەکینەی شتی قورس بەرزکردنەوە (خانووسازی).
(٤) داربەست (خانووسازی)؛ تەختەبەندی دەوری خانوو لەکاتی دروستکردنیدا.

**rigging** (rig′iŋ), ***n.*** (١) پەت‌و زنجیری بایەوان‌و ستوونی کەشتی.
(٢) کەرەسەی کار؛ کەرەسە.

**right** (rīt), ***adj.*** (١) ڕاست (هێڵ)؛ ڕێك: ***( a ~ line)*** .
(٢) وەستاو ( گۆشە): ***( a ~ angle)*** .
(٣) ڕەوا؛ ڕاست؛ باش؛ پەسەند؛ بەجێ؛ سەرڕاست؛ پاك: ***( ~ conduct)*** .
(٤) ڕاست؛ تەواو؛ بێ هەڵە؛ دروست: ***( the ~ answer)*** .
(٥) باش؛ بهات؛ گونجاو؛ شیاو.
(٦) دیوی خۆی؛ ئەو دیوەی کە دەبێ لە دەرەوە بێت ( قوماش، جل):
***( the ~ side of cloth)***
(٧) (ا) تەواو (مێشك). (ب) ژیر؛ مێشك تەواو.
(٨) تەندرووست؛ چاك.
(٩) ڕاست (دۆخ، بار)؛ ڕێك‌وپێك؛ باش؛ دروست:
***( Make thing ~ again.)***
(١٠) ڕاست (لا، دیو): ***( the ~ side)*** .
(١١) ڕاستڕەو (ڕامیاری)؛ کۆنەپەرست.
(١٢) [Archaic]، ڕاستەقینە.

***n.*** (١) ڕاستی‌و دروستی؛ بەجێیی؛ پەسەندی؛ باشی؛ ڕەوایی.
(٢) داد
(٣) ماف: ***( It was his ~ to say what he thought.)*** .
(٤) لای ڕاست؛ دیوی ڕاست.
(٥) (ا) دەستی ڕاست ( بۆکسبازی). (ب) مستەکۆڵەیەك بە دەستی ڕاست.
(٦) [R-]، حیزب یا ڕێکخراوێکی ڕاستڕەو؛ حیزب‌و ڕێکخراوە ڕاستڕەوەکان؛ هەڵوێستی ڕاستڕەوی.

***adv.*** (١) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ؛ ڕاستەوڕاست: ***( Go ~ home.)*** .
(٢) بە باشی؛ بە چاکی؛ بە ڕێك‌وپێکی.
(٣) بە تەواوی.
(٤) یەکسەر: هەر ئێستە؛ دەمودەست: ***( Come ~ now.)*** .
(٥) بەپێی یاسا؛ ڕەوا.
(٦) بە ڕاستی؛ بەبێ هەڵە.
(٧) لەلای ڕاستەوە؛ دیوی ڕاست.
(٨) زۆر:
***( He knows ~ well.; the ~ honorable ; the ~ reverend)***

***v.t.*** (١) ڕاستکردنەوە؛ خستنەوەسەر باری ڕاستی خۆی:
***( We ~ed the boat and started rowing.)***
(٢) ڕاستکردنەوە؛ هەڵە لێ دەرهێنان؛ چاك کردن.
(٣) ڕێك‌وپێك کردن.
(٤) بۆ بژاردن؛ تۆڵەسەندن؛ ڕاستکردنەوە ( ناڕەوایی): ***( to ~ a wrong)*** .

***v.i.*** ڕاستبوونەوە؛ بە ڕاستی یا لەسەر باری خۆ وەستان.

**all right,** باشە؛ چاکە؛ با وابێ!.

**by right ( or rights ),** ئەگەر ئەوەی ڕەوایەو ڕاستە بووترێ یا بکرێ.

**in one's own right,** بە شان‌و باهووی خۆ؛ بەبێ یارمەتی کەسێکی تر:
***( She is a queen in her own right.; She won the election in her own right.)***

**in the right,** ڕاست؛ ڕاست بوون:
***( He is in the right and you are in the wrong.)***

**right away ( or off),** یەکسەرا هەرئێستە:
***( Come right away.)***

**rightabout-face** (rīt′ə-bout′fās′), ***n.*** (١) وەرگەڕان؛ ڕوو وەرگێڕان؛ پێچکردنەوەی تەواو. (٢) گۆڕینی تەواوی بیروباوەڕ؛ وەرگەڕان (هەڵوێست)؛ هەڵگەڕانەوە.

**right angle,** گۆشەی وەستاو (واتە ٩٠ پلە).

**righteous** (rī′chəs), ***adj.*** (١) ڕاست (مرۆڤ)؛ ڕێگەی ڕاست گر؛ لەسەر ڕێی ڕاستە؛ دروست: ***( a ~ man)*** .
(٢) ڕەوا (مەسەلە، ماف، کردەوە)؛ ڕاست: ***( a ~ act)*** .

-righteously ***(adv.).***

**righteousness** (rī′chəs-nis), ***n.*** ڕەوایی کردارێك یا مەسەلەیەك؛ ڕاستی؛ ڕێگەی ڕاست: ***( his ~ ; the ~ of our cause)*** .

**rightful** (rīt′fəl), ***adj.*** (١) ڕەوا.
(٢) هی ڕاستی خۆی؛ خاوەن ماف؛ مافدار:
***( Return the watch to its ~ owner.; the ~ king)***

-rightfully ***(adv.)***; rightfulness ***(n.).***

**right-hand** (rīt′hand′), ***adj.*** (١) هی لای ڕاست؛ ڕاست؛ بەری ڕاست: ***( on the ~ side of the street)*** .
(٢) هی دەستی ڕاست؛ بە دەستی ڕاست.
(٣) زۆر پشت پێ بەستراو؛ دەستە ڕاست ( مەجاز):
***( my ~ man; the king's ~ man)***

-right hander ***(n.).***

**right-handed** (rīt′han′did), ***adj.*** (١) ڕاستلەر؛ ڕاستە؛ دەستی ڕاست بەکارهێنەر. (٢) بە دەستی ڕاست کراو.
(٣) بۆ دەستی ڕاست کراوە؛ بۆ بەکارهێنان بە دەستی ڕاست دروستکراوە.
(٤) لە چەپەوە بۆ ڕاست سووڕاوە یا ڕۆیشتوو؛ وەك دەستی کاتژمێر وەرچەرخاو.

**rightism** (rīt′iz′m), ***n.*** ڕاستڕەوی (ڕامیاری).

**rightist** (rīt′ist), ***n.*** ڕاستڕەو؛ کەسێکی ڕاستڕەو (ڕامیاری).

***adj.*** ڕاستڕەو: ***( a ~ party, organization, person, etc.)*** .

**rightly** (rīt′li), ***adv.*** (١) بە ڕەوایی؛ بە شێوەیەکی ڕەوا.
(٢) بە ڕێك‌وپێکی؛ بە جوان‌و باشی. (٣) بە ڕاستی؛ بەبێ هەڵە

**right-minded** (rīt′mīn′did), ***adj.*** خاوەن بیروڕای ڕاست‌و بەجێ.

**rightness** (rīt-nis), ***n.*** ڕاستی؛ تەواوی؛ بێ هەڵەیی؛ ڕەوایی؛ ڕێکی.

**right of search,** مافی پشکنین (هی کەشتی وڵاتێکی بێ لایەن بۆ شتی قاچاغ لەکاتی جەنگدا).

**right of way,** ***Also*** **right-of-way,** (١) مافی تێپەڕبوون لەپێشدا: مافی تێپەڕبوونی ئۆتومبیلێك یا کەشتییەك لەپێش ئەوی تردا لە چوار ڕێیانێکدا. (٢) مافی تێپەڕبوون: (ا) مافی تێپەڕبوون بە زەوی یا حەوشەی کەسێکی تردا بۆ گەیشتنە زەوی یا ماڵی خۆ.
(ب) ڕێگەو ڕێچکەی بەکارهێنراو بەم شێوەیە.
(٣) پارچە زەوی دەستبەسەرداگیراو بۆ ڕاکێشانی هێڵی شەمەندەفەرو ڕێگەو کارەبا.

**right triangle,** سێگۆشەی گۆشە وەستاو.

**right-wing** (rīt′wiŋ′), ***adj.*** ڕاستڕەو (ڕامیاری)؛ هی لقی ڕاستڕەوی حیزبێك.

**right wing,** لقی ڕاستڕەوی حیزبێك یا ڕێکخراوێك؛ حیزبێك یا ڕێکخراوێکی ڕاستڕەو.

right-winger ***(n.).***

**rigid** (rij′id), ***adj.*** (١) ڕەق؛ نانوشتێتەوە؛ سەخت: ***( a ~ bar)*** .
(٢) چەسپیو؛ نەجووڵاو.
(٣) توندوتیژ؛ بە زەبروزەنگ: ***( ~ regulations)*** .
(٤) لەڕێ لانەدەر؛ ڕەق؛ کەللەڕەق؛ نەگۆڕ:
***( a ~ person, teacher, parent, etc.)***

**rigidity** (ri-jid′ə-ti), ***n.*** (١) ڕەقی؛ سەختی.

(٢) توندوتیژی؛ رەقی؛ سەرسەختی.

**rigmarole** (rig′mə-rōl′), *n. Also* **rigamarole,** (١) قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا؛ قسەی هەلەق و مەلەق؛ قسەی قۆڕ.

(٢) شێوەی کاری ئاڵۆسکاو و بێ مانا.

**rigor** (rig′ẽr), *n. Also* **rigour,** (١) توندوتیژی؛ زەبروزەنگ: *( the ~ of martial law)*

(٢) باری ناخۆشی ژیان؛ ناخۆشی؛ گرفتاری؛ دژواری: *( the ~s of life)* .

(٣) سەختی ئاووهەوا.

(٤) کارێکی دڵڕەقانە یا بێ بەزەییانە؛ کارێکی چەوسێنەرەوە.

(٥) ووشکبوونی ڕیشاڵ و ئەندامی لەش.

(٦) لەرزین (نەخۆشی)؛ مووچرکە.

**rigorism** (rig′ẽr-iz′m), *n.* توندوتیژی (ڕەووشت، هەڵوێست، بڕیار)؛ زەبرو زەنگ.

**-rigorist** *(n.).*

**rigor mortis,** ووشکبوون یا ڕەق بوونی لەش لەپاش مردن.

**rigorous** (rig′ẽr-əs), *adj.* (١) توندوتیژ؛ ڕەق؛ بەزەبر: *( ~ laws; a ~ person)*

(٢) سەخت (ئاووهەوا): *( a ~ climate)* .

(٣) ڕەق؛ توندوتیژ: *( ~ standards)* .

**-rigorously** *(adv.)*; **rigorousness** *(n.).*

**rigour** (rig′ẽr), *n.* = **rigor.**

**rile** (rīl), *v.t.* [Colloq. or Dial.], (١) لیڵ کردن؛ تێکهەڵدانی شلە بە خلتەوە و لیڵ کردنی. (٢) تووڕەکردن؛ پەستکردن؛ ووروژاندن.

**rill** (ril), *n.* جۆگەلە.

**rill; rille** (ril), *n.* خەنەقی دووروودرێژ و چەم و دۆڵی سەر ڕووی مانگ.

**rillet** (ril′it), *n.* جۆگەلەی بچووک.

**rim** (rim), *n.* (١) قەراغ (بەتایبەتی هی شتێکی خڕ)؛ لێوار: *( the ~ of a bowl)*

(٢) چوارچێوەی ئاسنینی ڕەوڕەوە یا چەرخ کە تایەکەی دەخرێتە سەر؛ ئەڵقە: *( the ~ of a tire)*

*v.t.* (١) کردن بە ئەڵقەیەک بە دەوریدا.

(٢) خولانەوە بە دەوری قەراغەکەیدا ( وەک تۆپی "گۆڵف" بە دەوری کونەکەدا).

**rime** (rīm), *n.* , *v.i.* & *v.t.* = **rhyme.**

**rime** (rīm), *n.* زوقمی سەرگیاو داروودرەخت.

*v.t.* بە زوقم داپۆشینی گیاو لق و پۆپی دار.

**rimer** (rīm′ẽr), *n.* = **rhymer.**

**rime riche,** هاوکێشەیی یا هاودەنگی‌یەکی دوا ووشەکانی دێڕە هەڵبەست کە ووشەی وەها بەکاردێنێ کە دەنگیان چوون یەکەو مانایان جیاوازە: ( وەک " write, right " یا " night, knight ").

**rimester** (rīm′stẽr), *n.* = **rhymester.**

**rimose** (rī′mōs, rī-mōs′), *adj.* قلیش قلیش؛ درزاوی؛ تلیش تلیش.

**rimple** (rim′p'l), *n.* چرچ؛ لۆچ.

*v.t.* & *v.i.* چرچ و لۆچ کردن؛ چرچ و لۆچ بوون.

**rimy** (rīm′i), *adj.* زوقماوی؛ بە زوقم داپۆشراو.

**rind** (rīnd), *n.* تونکڵ (میوە).

**rinderpest** (rin′dẽr-pest′), *n.* تاعوونی ڕەشەووڵاخ و مەڕوبزن.

**ring** (riŋ), *v.i.* (١) زرنگانەوە؛ زرەهاتن.

(٢) دەنگدانەوە؛ وا دەرکەوتن: *( Her promises rang false.)* .

(٣) زەنگ لێدان؛ لێدان ( زەنگ).

(٤) زەنگ بۆ لێدان؛ بانگ کردن بە زەنگ: *( She rang for the maid.)* .

(٥) دەنگدانەوە؛ دەنگ لێوە هاتن: *( The room rang with merriment.)*

(٦) زرنگانەوە ( گوێ، مێشک).

*v.t.* (١) زەنگ لێدان؛ لێدان ( زەنگ). (٢) بانگ بۆ دان.

(٣) پارە تاقیکردنەوە بە زرنگانەوەی؛ جرنگانەوەی؛ زرە لێ هەڵساندن.

(٤) ( ~ **up** )، تەلەفۆن بۆ کردن: *( I'll ~you up tonight.)* .

*n.* (١) دەنگی زەنگ؛ زرە.

(٢) (ا) دەنگێکی وەک هی زەنگ؛ قاقا؛ هاڕە: *( the ~ of laughter)* .

(ب) دەنگێکی زرنگانەوە؛ دەنگدانەوە.

(٣) دەنگێکی تایبەتی؛ نیشانە: *( the ~ of pride)* .

(٤) کۆمەڵە زەنگ. (٥) زەنگ لێدان.

(٦) زەنگ یا دەنگی تەلەفۆن.

(٧) تەلەفۆن؛ پەیوەندی بە تەلەفۆن: *( Give me a ~ .)* .

**ring down the curtain,** (١) پەردەی شانۆ هێنانە خوارەوە؛ شانۆنامە کۆتایی پێ هێنان. (٢) دوایی پێ هێنان؛ تەواوکردن؛ کۆتایی پێ هێنان.

**ring in,** (١) دەستپێکردن ( وەک بە زەنگ لێدان)؛ بانگی دەستپێکردن دان ( وەک بە کاتژمێر)؛ نیشانەکردن: *( to ring in the new year)*

(٢) [Slang]، بە ساختە هێنانە ژوورەوە.

**ring the bell,** سەرکەوتن.

**ring up,** تۆمارکردنی نرخی فرۆتەنی بە مەکینەی تۆمارکردن و ژماردنی فرۆشگا لەلایەن دەغیلەچی‌یەوە: *( to ring up an item )* .

**ring up the curtain,** (١) پەردەی شانۆ کردنەوە یا بەرزکردنەوە؛ دەست بە شانۆنامە کردن. (٢) دەستپێکردن.

**ring** (riŋ), *n.* (١) ئەموستیلە؛ ئەنگوستیلە؛ مستیلە.

(٢) ئەڵقە: *( a key ~ )* .

(٣) ئەڵقەی پێچ لوولی. (٤) شێوەیەکی خڕ.

(٥) بازنە؛ چەرخ؛ خڕۆک. (٦) تابلۆوقە؛ ئەڵقە.

(٧) ئەڵقەی قەدی دار (کە تەمەنی دارەکە پیشان دەدات).

(٨) ئەڵقەی هەڵپەڕکێ.

(٩) دەستەیەک یا تاقمێکی خۆپەرست (لە بازرگانی یا ڕامیاریدا).

(١٠) گۆڕەپانی خڕ (بۆ بۆربۆرێن و نواندن): *( a circus ~ )* .

(١١) مەیانی بۆکسبازی.

(١٢) بۆکسبازی؛ پیشەی بۆکسبازی: *( the ~ )* .

(١٣) شوێنی بلیت کڕین و گرەوکردن لەسەر غارغارێن و بۆربۆرێنی تردا.

(١٤) بۆربۆرێن یا ملەملێ (بەتایبەتی هی ڕامیاری وەک خۆ هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان یا سەرەک کۆمار): *( He tossed his hat in the ~ .)* .

*v.t.* (١) دەورەدان؛ تابلۆوقەدان.

(٢) وەک ئەڵقە لێکردن؛ خڕکردن؛ کردن بە ئەڵقە.

(٣) ئەڵقە کردنە لووتەوە (کەڵەگا، بەران).

(٤) تاژاڵ خڕکردنەوە.

(٥) هاویشتنی ئەڵقەیەک یا نالێک بۆ کردنی بە مێخێکدا.

(٦) لێکردنەوەی ئەڵقەی قەدی دارێک لە دارەکە.

**ringbolt** (riŋ′bōlt′), *n.* برغو یا بزماری ئەڵقە بە سەرەوە.

**ringbone** (riŋ′bōn′), *n.* زیادە ئێسقانی مووچە یا مەچەکی ئەسپ (کە دەبێتەهۆی شەلی).

**ringdove** (riŋ′duv′), *n.* کۆتری خەت لەمل؛ کۆتری خاڵ لە مل.

**ringed** (riŋd), *adj.* (١) مستیلە لە دەست؛ دیاریکراو (ژنهێنان)؛ مارەکراو؛ نیشانەکراو. (٢) بە ئەڵقە ڕازاوە؛ بە ئەڵقە نیشانەکراو.

(٣) دەورەدراو؛ تابلۆوقەدراو.

(٤) وەک ئەڵقە لێ هاتوو.

**ringent** (rin′jənt), *adj.* (١) داچەقیو؛ کراوە.

(٢) لێو کراوە ( کۆپەرەی هەندێ گوڵ).

**ringer** (riŋ′ẽr), *n.* (١) نال یا ئەڵقەی هاوێژراو بەسەر مێخێکدا بۆ پیاکردنی. (٢) هاویشتنێکی وەها.

**ringer** (riŋ′ẽr), *n.* (١) زەنگ لێدەر.

(٢) [Slang]، (ا) ئەسپێک یا یاریکەرێکی بە ساختە بەشدارکراو لە پێشبڕکێیەکدا. (ب) کەسێکی کتومت لە کەسێکی تر چوو: *( He's a ~ for his father.)*

**ring finger,** پەنجەی ئەموستیلە.
**ringleader** (riŋ′lēd′ẽr), ***n.*** سەردەستە (بەتایبەتی هی یاخی بوونێك، کۆمەڵێکی نهێنی، ئاشووبێك، یا تاقمێکی شەلاتی)؛ سەرگەورە؛ سەرکردە.
**ringlet** (riŋ′lit), ***n.*** (١) ئەڵقەی بچووك. (٢) ئەڵقەی پرچ.
**ringmaster** (riŋ′mas′tẽr, riŋ′mäs′tẽr), ***n.*** سەرکار یا بەڕێوەبەری سێرك.
**ring-neck** (riŋ′nek′), ***n.*** باڵندەی خاڵ لە مل یا خەت لە مل.
**ring-necked** (riŋ′nckt′), ***adj.*** خەت لە مل یا خاڵ لە مل (باڵندە، گیاندار)
**ringside** (riŋ′sīd′), ***n.*** تەنیشتی مەیان یا ئەڵقەی بۆربۆڕێن:
(ا) کورسی‌یە نزیکەکانی مەیان یا ئەڵقەی بۆکسبازی‌و سێرك.
(ب) شوێنێکە کە بە ئاسانی ڕووداێکی لێوە ببینری؛ شوێنی نزیك لە ڕووداوێکەوە.
**ringtoss** (riŋ′tôs′), ***n.*** یاری‌یەکە بریتی‌یە لە هاویشتنی ئەڵقەی گوریس یا پەت بۆسەر مێخێك بۆ پیاکردنی.
**ringworm** (riŋ′wūrm′), ***n.*** جۆرە نەخۆشی‌یەکی پێستە.
**rink** (riŋk), ***n.*** (١) یاریگای سەهۆڵ خلیسکێ؛ مەیانی بەفرە خلیسکێ (لە ژوورەوە). (٢) زەمینەیەکی لووسی تەختەیە بۆ لەسەر خلیسکان.
(٣) خانووی مەیانی سەهۆڵ خلیسکێ.
**rinse** (rins), ***v.t.*** (١) ئاو تێوەردان؛ ئاو تێ ڕادان
(٢) (ا) بەردەشۆرکردن؛ شۆردنەوە. (ب) شتن (سەر، لەش)؛ شۆردن.
***n.*** (١) ئاو تێوەردان؛ ئاو تێ ڕادان. (٢) ئاوی ئاو تێوەردان یا شۆردنەوە.
**rinsing** (rin′siŋ), ***n.*** (١) (ا) چڵکاو؛ ئەو ئاوەی شتی پێ شۆراوە یا تێوەردراوە. (ب) خڵتە. (٢) ئاو تێوەردان؛ ئاو تێ ڕادان؛ شۆردنەوە.
**riot** (rī′ət), ***n.*** (١) ئاشووب؛ ئاژاوە؛ فەرتەنە؛ هەراو فەرتەنە؛ فیتنە.
(٢) قاقای پێکەنین؛ تەقینەوە (پێکەنین).
(٣) زەبەنەیی (ڕەنگ)؛ زۆری؛ زۆرو زەبەنەیی.
(٤) (ا) زەماوەندی بەرەڵا؛ بەزم‌ورەزم؛ ئاهەنگی دەنگەدەنگاوی.
(ب) بەرەڵایی؛ سەرسەرێتی.
(٥) [Slang]، کەسێك یا شتێکی زۆر سەیرو پێکەنیناوی؛ کەسێکی زۆر قۆشمە: ***( He is a ~.; This television show is a ~.)*** .
***v.i.*** (١) ئاژاوە نانەوە؛ ئاشووب گێڕان؛ فەرتەنە خستنەوە.
(٢) (ا) بەزم‌ورەزم گێڕان؛ زەماوەندکردن؛ ئاهەنگی دەنگەدەنگاوی گێڕان.
(ب) سەرسەرێتی کردن؛ بە بەرەڵایی‌یانە ژیان.
(٣) جڵەو بۆ خۆ شل کردن.
***v.t.* ( ~ away ),** پارە بە بەردا دان؛ پارە یا کات بەفیڕۆدان بە شێتانە.
**run riot,** (١) بەرەڵابوون؛ بەلەسەبوون؛ جڵەو بۆ خۆ شل کردن بە تەواوی.
(٢) بە زۆرو زەبەنەیی ڕووان؛ تەرز فڕێدان بە هەموولایەکدا؛ ئێجگار زۆر بوون.
**read the riot act to,** داوالێکردن بە بڕینەوەی ئاشووب ئەگینا سزادان.
**riotous** (rī′ət-əs), ***adj.*** (١) ئاشوباوی؛ ئاژاوەیی؛ فەرتەنەیی.
(٢) ئاشووبگێڕ؛ ئاژاوەچی. (٣) دەنگەدەنگاوی؛ بە دەنگی بەرزو غەڵبەغەڵبەوە.
(٤) سەرسەری؛ بەرەڵا؛ بێ ئابڕوو. (٥) زۆر بە برشت‌و چڕو سەوزو پاراو.
**rip** (rip), ***v.t.*** (١) دادڕین؛ داتلیشاندن؛ هەڵتلیشاندن؛ هەڵدڕین.
(٢) ( ~ **off** ; ~ **out** )، لێکردنەوە؛ لێ دڕین؛ لێ دڕاندن.
(٣) دڕاندن؛ دڕان؛ دڕین.
(٤) داتلیشاندن ( داروتەختە)؛ قلیشاندن؛ بڕینەوە؛ لەتکردن.
***v.i.*** (١) دڕان؛ هەڵتلیشان؛ لێکبوونەوە؛ دادڕان.
(٢) [Colloq.]، بە خێراو توندوتیژی جووڵانەوە.
(٣) [Colloq.]، ( ~ **into** )، هێرش بردنە سەر (بە دەم)؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن: ***( He ~ped into his opponent's record.)*** .
***n.*** (١) دڕاوی؛ شوێنی دڕاو؛ دڕان.
(٢) دڕاندن؛ لێکردنەوە؛ داتلیشان.
**rip into,** [Colloq.], هێرش بردنە سەر ( بەدەم)؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن.
**rip out,** [Colloq.], بە تووڕەیی‌یەوە وتن؛ قیژاندن.
**rip** (rip), ***n.*** خوڕاو یا گێژاوێك کە لە بەیەکگەیشتنی دوو شەپۆل پەیدادەبێت: ***( a ~ tide)*** .
**rip** (rip), ***n.*** [Colloq.], (١) کەسێکی سەرسەری؛ کەسێکی بەرەڵاو بێ ڕەووشت. (٢) ئەسپێکی پیرو بێ کەڵك. (٣) شتێکی بێ کەڵك.
**riparian** (ri-pâr′i-ən, rī-pâr′i-ən), ***adj.*** هی قەراغ ڕوبارو دەریاچە؛ لە قەراغ ڕوبارو دەریاچە ژیاو یا کراو.
**rip cord,** (١) پەتی پەڕەشووت کردنەوە (بە ڕاکێشانی لەکاتی نزم بوونەوەدا). (٢) پەتی ڕاکێشراو بۆ بەرەڵاکردنی گازی باڵون بۆ نزم بوونەوە.
**ripe** (rīp), ***adj.*** (١) گەییو (میوە، دانەوێڵە).
(٢) گەییو؛ پڕ؛ تەڕوبڕ: ***( ~ lips)*** .
(٣) پێگەیشتووە؛ ماوەیەکی تەواوی بەسەردا ڕۆیشتووە؛ کۆن: ***( ~ cheese, wine, etc.)***
(٤) بەساڵدا کەوتوو؛ بەتەمەن: ***( a person of ~ years)*** .
(٥) ئامادە: ***( ~ for mischief)*** .
(٦) کاتی خۆیەتی؛ کاتێتی: ***( The time is ~ for action.)*** .
(٧) گەییو (دوومەڵ).
-**ripely** *(adv.)*; **ripeness** *(n.)*.
**ripen** (rīp′ən), ***v.i. & v.t.*** پێگەیین؛ گەیین؛ پێگەیشتن (میوە، دانەوێڵە): ***( Let the apples ~ before you pick them.)*** .
**riposte, ripost** (ri-pōst′), ***n.*** (١) هێرشێکی لەپڕو خێرا ( شیربازی)؛ شیر پیاکردنی خێرا. (٢) وەڵامێکی خێراو توندوتیژ.
***v.i.*** (١) هێرش بردن بە شیر بە خێرا.
(٢) وەڵام دانەوە بە توندوتیژی‌و بە خێرا.
**ripple** (rip′′l), ***v.i.*** (١) شەپۆلی بچووك بچووك دان.
(٢) کەروێشکەکردن ( گەنم‌و جۆو گیا)؛ بە شێوەی شەپۆلی بچووك بچووك جووڵانەوە. (٣) خوڕەخوڕهاتن؛ خوڕەهاتن.
***v.t.*** (١) شەپۆلی بچووك بچووك تێخستن.
(٢) کەروێشکەپێکردن؛ جووڵاندنەوە بە شێوەی شەپۆل.
(٣) خوڕەخوڕ لێ هەڵساندن.
***n.*** (١) شەپۆلی بچووك؛ ووردە شەپۆل.
(٢) کەروێشکەکردن؛ جووڵانەوەیەکی وەك شەپۆلی بچووك.
(٣) خوڕەی ئاو؛ خوڕەخوڕی ئاو.
(٤) خوڕاوێکی بچووك؛ ڕێژاوێکی بچووك.
**ripple** (rip′′l), ***n.*** چیکنە (بۆ تۆوی پەموو کەتان دەرهێنان یا جیاکردنەوە).
***v.t.*** جیاکردنەوەی تۆوی پەموو و کەتان.
**ripplet** (rip′lit), ***n.*** شەپۆلێکی زۆر بچووك.
**ripply** (rip′li), ***adj.*** (١) خوڕەخوڕکەر؛ خوڕەخوڕاوی. (٢) شەپۆلاوی.
**riprap** (rip′rap′), ***n.*** (١) کەڵەکە بەرد؛ بستووی بەرد.
(٢) بەردە شکاوی کەڵەکە بەرد.
***v.t.*** کەڵەکە بەرد هەڵچنین یا درووستکردن؛ بە کەڵەکە بەرد پاڵپشتی کردن یا بەهێزکردن.
**ripsaw** (rip′sô′), ***n.*** مشاری ددان زل.
**ripsnorter** (rip′snôr′tẽr), ***n.*** [Slang], کەسێك یا شتێکی سەرناسا لە نایابی‌و بەهێزی‌و توندوتیژیدا.
**riptide** (rip′tīd′), ***n.*** دوو شەپۆلی بەیەکدادەرو گێژاو درووستکەر
**rise** (rīz), ***v.i.*** (١) هەڵسانە سەر پێ؛ ڕاستبوونەوە؛ هەڵسان؛ هەستان.
(٢) لەخەوهەڵسان. (٣) زیندووبوونەوە: ***( He rose from the grave.)*** .
(٤) شۆڕش کردن؛ یاخی بوون؛ ڕاپەڕین؛ لێ هەڵسان: ***( The people rose against the King.)***
(٥) دوایی بە کۆڕ هێنان؛ کۆتایی پێ هێنان: ***( The legislature rose for vacation.)***
(٦) بەرزبوونەوە؛ بڵندبوونەوە.
(٧) هەڵهاتن (ڕۆژ، مانگ...هتد)؛ هەڵاتن: ***( The moon rose.)*** .
(٨) بەرزبوونەوە؛ هەڵسان (ئاو، لافاو): ***( The river rose rapidly.)*** .
(٩) پلەوپایە بەرزبوونەوە؛ سەرکەوتن؛ بەرزبوونەوە لە کۆمەڵدا؛ پێشکەوتن؛

دەسەلات زۆر پەیداکردن.
(١٠) قیت بوونەوە؛ ڕەق بوون؛ ڕەپ بوون؛ هەڵسان.
(١١) بەرزبوونەوە؛ بەرەوژووربوونەوە: *( The hills ~ steeply)* .
(١٢) هاتنەسەر ئاو ( ماسی)؛ سەر لە ئاو هێنانەدەرەوە؛ هاتنەسەر ڕووی ئاو.
(١٣) بەرزبوونەوە ( دەنگ)
(١٤) زیادبوون (پلە، بڕ، ژمارە، نرخ...هتد)؛ زیادکردن؛ بەرزبوونەوە.
(١٥) گەورەبوون (دەنگ)؛ بەرزبوونەوە.
(١٦) بەرزبوونەوە (کەیف)؛ بەهێزتربوون؛ کەیف خۆش بوون:
***( His spirits rose.)***
(١٧) هەلاتن ( هەویر). (١٨) دەرکەوتن؛ سەردەرهێنان.
(١٩) دەستپێکردن. (٢٠) هەڵقوڵان. (٢١) ڕوودان
(٢٢) هاتنە بەرچاو. (٢٣) هاتنە بەرگوێ.
(٢٤) دروستکران: *( A house is ~ing on the hill.)* .
*v.t.* (١) هەڵساندن (باڵندە لە هێلانەوە یا ماسی بۆسەر ئاو بۆ ڕاوکردن).
(٢) دەرخستن لە ئاسۆوە.
***n.*** (١) هەڵهاتن (مانگ، ڕۆژ)؛ هەلاتن. (٢) بەرزبوونەوە؛ بۆ سەرەوە چوون.
(٣) پلەو پایە بەرزبوونەوە؛ بەرزبوونەوە لە کۆمەڵدا.
(٤) هاتنەسەر ئاو ( ماسی)؛ سەر بەرزکردنەوە بۆسەر ڕووی ئاو.
(٥) زیندووبوونەوە. (٦) گرد؛ بەرزایی.
(٧) بەرەوژوورکە؛ بەرەوژوورە. (٨) ئاو هەڵسان
(٩) بەرزی؛ پلەی بەرزی (پێ پیلکە).
(١٠) بەرزبوونەوەی دەنگ؛ دەنگ گەورەبوون
(١١) زیادبوون (ژمارە، هەند، پلە، نرخ)؛ بەرزبوونەوە؛ زیادکردن.
(١٢) سەرچاوە؛ شوێنی هەڵقوڵان؛ هەڵقوڵان
(١٣) [British]: مووچە یا ڕۆژانە بەرزبوونەوە
**get a rise out of,** [Slang], تووڕەکردن و هاندان بۆ کردنی شتێکی تایبەتی؛ وروژاندن و تیز پێوەکردن و ڕق هەڵساندن
**give rise to,** بوون بەهۆی
**rise to,** لێهاتوویی خۆ پیشاندان: *( He rose to the occasion.)* .
**riser** (rīz′ẽr), ***n.*** (١) لە خەو هەڵساو؛ هەڵساو:
***( an early ~ ; a late ~ )***
(٢) ئەو بەشەی وەستاو یا ستوونی پێ پیلکەیەکە کە دوو پێ پیلکە بەیەك دەگەیەنێ؛ ئەو بەشەی نێوان دوو پێ پیلکەیەکە وەك پێ پیلکەکەی لەسەر ڕاوەستابێ وایە
**risibility** (riz′ə-bil′ə-ti), ***n.*** (١) توانای پێکەنین؛ حەز لە پێکەنین کردن. (٢) *(pl.)*: قۆشمەیی؛ هەستی قۆشمەیی یا خەڵك هێنانە پێکەنین.
(٣) پێکەنین
**risible** (riz′ə-b′l), ***adj.*** (١) حەز لە پێکەنین کەر.
(٢) تایبەتی بە پێکەنین (٣) سەیر؛ قۆشمە؛ مرۆڤ هێنەرە پێکەنین.
**rising** (rīz′iŋ), ***adj.*** (١) بەرزبووەوە؛ بەرەوژووربووەوە؛ لە خەو هەڵساو؛ لە بەرزبوونەوەدایە: *( a ~ tide)*
(٢) لە تەمەن گەورەبوون و پێگەیشتندایە *( the ~ generation)* .
***prep.*** [Colloq.], (١) تەختێك زیاتر لە
(٢) [Dial.]: خۆی داوە لە؛ نزیکەی ئەوەندەیە *( He was ~ fifty.)*
***n.*** (١) ڕاپەڕین؛ شۆڕش؛ یاخی بوون
(٢) نووك؛ چوکڵە؛ بەرزایی؛ شتی دەرپەڕیو
(٣) [Dial.]: دوومەڵ
**risk** (risk), ***n.*** (١) مەترسی (٢) سەرچڵی؛ خۆ دان بە دەم مەترسییەوە بەبێ لێکدانەوە؛ پڕکێشی (٣) (أ) ئەوانەبوونی زیان لێکەوتن (بیمە).
(ب) مەترسی بیمەکردنی کەسێك یا شتێك
***v.t.*** (١) خستنە مەترسییەوە: *( We ~ed our lives.)* .
(٢) پڕکێشی کردن؛ خۆ دان بە دەم مەترسییەوە؛ ئامادەبوون بۆ هەرچ شتێك کە ڕوویدات *( to ~ failure)*
**run ( or take ) a risk,** خۆ دان بە دەم مەترسییەوە؛ ژیانی خۆ خستنە مەترسییەوە.

**risky** (ris′ki), ***adj.*** پڕ مەترسی؛ دووبەختی؛ مەترسیدار؛ ترسناك.
**risotto** (rē-sôt′tô), ***n.*** خواردەمەنییەکە بریتییە لە برنجی بە گۆشتاو لێنراو و تێکەڵاوکراو لەگەڵ پەنیری جنراودا.
**risqué** (ris-kā′), ***adj.*** بێ شەرم (جل‌وبەرگ، کردەوە، سوعبەت، گفتوگۆ)؛ بێ پەردە؛ هەڵماڵراو: *( a ~ joke)* .
**rite** (rīt), ***n.*** (١) نەریتی ئاینی.
(٢) بەندوباو و نەریتی کۆمەلایەتی: *( the ~s of courtship)* .
(٣) بەندوباو و نەریت؛ خوونەریت.
(٤) [R-]، لقی ئاینی (خاچ پەرستی).
(٥) [R-]، شێوەو نەریتی خوداپەرستی و نوێژو نزای تایبەتی بە کڵێسەیەك.
**ritual** (rich′ōō-əl), ***adj.*** هی بەندوباو و نەریت: *( a ~ dance)* .
***n.*** (١) خوو و نەریتی ئاینی و کۆمەلایەتی و...هتد.
(٢) پەیڕەوکردنی خوو و نەریتی ئاینی و کۆمەلایەتی.
(٣) پەڕتووکی خوو و نەریتی ئاینی. (٤) سەرجەمی خوو و نەریت.
**ritualism** (rich′ōō-əl-iz′m), ***n.*** (١) پەیڕەوکردنی نەریت؛ خوو و نەریت خوازی. (٢) لێکۆڵینەوەی نەریتی ئاینی.
**ritualist** (rich′ōō-əl-ist), ***n.*** (١) زانای خوو و نەریت.
(٢) نەریت خواز؛ بە وردی پەیڕەوکەری نەریت.
**ritualistic** (rich′ōō-ə-lis′tik), ***adj.*** (١) نەریتی؛ تایبەتی بە خوو و نەریت. (٢) نەریت خواز؛ بە وردی پەیڕەوکەری خوو و نەریت.
**-ritualistically** ***(adv.).***
**ritzy** (rit′si), ***adj.*** [Slang], کەشخە (شوێن)؛ جوان و نایاب؛ فەنتازی:
***( a ~ hotel)***
**rivage** (riv′ij), ***n.*** کەنار دەریا و ڕووبار.
**rival** (rī′v′l), ***n.*** (١) هاوچاو؛ خەنیم؛ ڕقەبەر. (٢) شان لە شان دەر؛ هاوتا.
(٣) [Obs.]، ناوەڵ؛ هاو؛ هاوکار.
***adj.*** هی هاوچاو؛ هی هاوچاوی.
***v.t.*** (١) هاوچاوی لەگەڵ کردن؛ هاوچاوبوون؛ ملەملێ کردن.
(٢) شان لە شان دان؛ هاوتابوون:
***( He ~ed his father in intelligence.)***
*v.i.* [Archaic], هاوچاوی لەگەڵ کردن؛ ملەملێ کردن.
**rivalry** (rī′v′l-ri), ***n.*** هاوچاوی؛ هاوچاوکەری؛ ملەملێ.
**rive** (rīv), *v.t.* (١) پارچە پارچە کردن؛ دڕاندن؛ لێك جیاکردنەوە؛ کەرتکردن؛ هەڵتڵیشاندن؛ هەڵقڵیشاندن. (٢) شەق پێ بردن (دڵ)؛ پچڕاندن؛ دڵ دەرهێنان: *( to ~ the heart with grief)* .
*v.i.* شەق بردن؛ پچڕان؛ لێك جیابوونەوە؛ هەڵقڵیشان.
**riven** (riv′'n), *alternative past participle of* **rive.**
*adj.* شەق بردوو؛ پچڕاو؛ قڵیشاو؛ دڕاو؛ کەرت کەرت.
**river** (riv′ẽr), ***n.*** (١) ڕووبار؛ ڕێ؛ چەم.
(٢) هەندێکی زۆر لە شتێك کە وەك ئاوی ڕووبار لەبەری بڕوات؛ جۆگە (مەجاز)
***( a ~ of tears)***
**sell down the river,** فرۆشتن (مەجاز)؛ دەستبڕین؛ ناپاکی لەگەڵ کردن (لە فرۆشتنی بەندی قولەڕەشەوە لە ناوچەی خوارووی ڕووباری " میسیسیپی" هاتووە).
**river** (rīv′ẽr), ***n.*** قلیشێنەر؛ شەق پێ بەر؛ پارچەپارچەکەر.
**river bank,** قەراغی ڕووبار؛ کەناری ڕووبار.
**river bed,** زەمینەی ڕووبار؛ بنی ڕووبار (کە ڕووبارەکەی بەسەردا دەڕوات).
**riverhead** (riv′ẽr-hed′), ***n.*** سەرچاوەی ڕووبار.
**river horse = hippopotamus.**
**riverine** (riv′ẽr-īn′, riv′ẽr-in), ***adj.*** (١) هی قەراغ ڕووبار؛ هی ئەم بەرو ئەوبەری ڕووبار؛ لە دەوروپشتی ڕووبار.
(٢) ڕووباری؛ تایبەتی بە ڕووبار.
**riverside** (riv′ẽr-sīd′), ***n.*** قەراغی ڕووبار؛ کەناری ڕووبار.
*adj.* لە قەراغی ڕووبار.
**rivet** (riv′it), ***n.*** بزماری پەرچدراو؛ بزماری پەرچ.

***v.t.*** (١) به بزماری پەرچ قایم کردن.
(٢) پەرچدانەوەی سەری بزمار. (٣) چەسپاندن؛ قایم کردن؛ به قایم بەستنەوە.
(٤) ( ~ on : ~ upon ) ، چاو تێ برین؛ گوێ باش پێدان؛ سەرنج پێدان.
(٥) به تەواوی سەرنج ڕاکێشان؛ به تەواوی خەریك کردن.

**riviere** (rē-vyer′), ***n.*** ملوانکەی ئەلماس یا بەردی بەنرخی تر.

**rivulet** (riv′yoo-lit), ***n.*** جۆگەلە

**roach** (rōch), ***n.*** = cockroach.

**roach** (rōch), ***n.*** جۆرە ماسییەکی ڕوبارە.

**roach** (rōch), ***n.*** (١) کاکۆڵی داهێنراو لە ناوچەوانەوە بە پشتدا یا لە لاجانگەوە بۆ سەرەوە. (٢) قنگەجگەرەی مەریوانە.
***v.t.*** (١) قژداهێنان بە پشتدا یا بۆ سەرەوە. (٢) برینی یاڵی ئەسپ.

**road** (rōd), ***n.*** (١) ڕێ؛ ڕێگە؛ ڕێگا؛ ڕێوبان.
(٢) ڕێباز؛ ڕێ؛ ڕێگە: *( the ~ to success, fortune, etc.)* .
(٣) ڕێی ئاسن؛ هێڵی شەمەندەفەر.
(٤) ( *pl.* )؛ لەنگەرگای کەشتی لە کەناری دەریادا.
( پێشی دەوروترێ: " **roadstead** ").

**on the road,** (١) بەڕێوە (وەك تیپی شانۆگەری کە هەر ڕۆژە شانۆنامەکەیان لە شارێك دەنوێنن).
(٢) هەمیشە هاتوچۆکەر ( وەك فرۆشیاری گەڕۆك)؛ بەڕێوە.
(٣) گەڕۆك؛ ڕەوەند؛ وێڵ

**take to the road,** (١) کەوتنەڕێ؛ دەست بە گەشت کردن؛ ڕێگە دانەبەر.
(٢) [Archaic]. بوون بە چەتە

**road agent,** چەتە

**roadbed** (rōd′bed′), ***n.*** (١) (ا) بنچینەی ڕێگەی ئاسن؛ بناغەی ژێر هێڵی شەمەندەفەر. (ب) ووردە بەردو چەوی ژێر هێڵی شەمەندەفەر.
(٢) بناغەو ڕووی ڕێگەوبان.

**roadblock** (rōd′blok′), ***n.*** (١) ڕێ بەست ( کە ڕێی پێ دەگیرێ لەلایەن سوپا و هێزی پۆلیسەوە). (٢) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ.

**road hog,** ئوتومبیلچی چاوبرسی: ئوتومبیلچییەکە کە ڕێگەکە هەمووی داگیردەکات و ناهێڵێت کەس پێشی کەوێت چونکە لە ناوچەقی ڕێگەکەوە لێ دەخوڕێت

**roadhouse** (rōd′hous′), ***n.*** خان: کاروان سەرا؛ چێشتخانەو مەیخانە یا یانەیەکی سەر ڕێگای دەرەوەی شارە.

**road metal,** ووردە بەردو بەردی شکاوی ڕێ پێ چەوڕێژکراو یا ئامادەکراو بۆ قیرتاوکردن

**road runner,** باڵندەیەکی کلك زۆر درێژی کلاو لەسەری بەڵەکاوی تیژڕەوی خوارووی ڕۆژاوای ئەمەریکایە لەباتی فڕین ڕادەکات و حەز لە ڕێگە پەڕینەوە دەکات بە ڕاکردن.

**roadside** (rōd′sīd′), ***n.*** قەراغەڕێ؛ لاڕێ
***adj.*** هی قەراغەڕێ؛ هی لاڕێ: *( a ~ restaurant, gas station, etc.)* .

**roadstead** (rōd′sted′), ***n.*** لەنگەرگای کەشتی لەکەناری دەریادا.
(پێشی دەوروترێ: " **roads** ").

**roadster** (rōd′stēr), ***n.*** (١) ئوتومبیلێکی سەرکراوەیە بە کورسییەکی دوو سێ کەسییەوە (٢) ئەسپی سواری ڕێگەوبان. (٣) پاسکیل.

**roadway** (rōd′wā′), ***n.*** (١) ڕێگە؛ ڕێ
(٢) سەرەڕێ؛ ئەو بەشەی ڕێگە کە ئوتومبیلی پێدا دەڕوات

**roam** (rōm), ***v.i.*** گەڕان؛ سووڕانەوە؛ گەڕان بەبێ مەبەست.
***v.t.*** پێدا گەڕان؛ پێدا ڕۆیشتن؛ پێدا سووڕانەوە:
*( to ~ the fields, streets, etc.)*
***n.*** گەڕان؛ سووڕانەوە؛ جادە پێوان.

**roan** (rōn), ***adj.*** کوێت یا شێ بە پەڵەپەڵەی سپییەوە (ئەسپ).
***n.*** (١) ڕەنگی قاوەیی سوورکار بە پەڵەپەڵەی سپییەوە.
(٢) ئەسپی کوێت یا شێ بە پەڵەپەڵەی سپییەوە.

**roar** (rôr, rōr), ***v.i.*** (١) نەڕاندن؛ قۆڕاندن؛ نەڕەکردن؛ قۆڕەکردن؛ بۆڕاندن *( The lion ~ed.)* .
(٢) هاوارکردن؛ قیژاندن؛ بۆڕاندن ( لە ئازاردا).
(٣) بە دەنگی بەرزو خیزەخیزەوە هەناسەدان ( ئەسپ).
(٤) گرمەگرم کردن؛ گرمەهاتن؛ بە دەنگی زل قسەکردن یا پێکەنین.
(٥) گرمەهاتن (هەورەگرمە، ئوتومبیل، تفەنگ، دەبابە، زریان...هتد)؛ ووڕەهاتن؛ هاژەهاژ هاتن:
*( The tanks ~ed down the road.; The storm ~ed.)*
(٦) دەنگدانەوە.
***v.t.*** بە نەڕە ووتن؛ بە دەنگی بەرز ووتن؛ گرماندن؛ نەڕاندن:
*( He ~ed a welcome.)*
***n.*** (١) نەڕە؛ نەڕەنەڕ؛ قۆڕە؛ بۆڕە:
*( The ~ of a lion, tiger, bull, etc.).*
(٢) قاقای پێکەنین: *( the ~ of laughter)* .
(٣) گرمە (هەورەگرمە، دەبابە، زریان، شەپۆل)؛ هاڕە؛ هاژەهاژ؛ هاژە.

**roaring** (rôr′iŋ, rōr′iŋ), ***n.*** (١) نەڕاندن؛ بۆڕەبۆڕ هاتن؛ قۆڕەکردن؛ بۆڕان. (٢) نەڕە؛ بۆڕە؛ قۆڕە؛ گرمە؛ گرمەگرم.
(٣) نەخۆشییەکی ئەسپە دەبێتە هۆی هەناسەدان بە گران و بە دەنگی بەرز
***adj.*** (١) بە دەنگی بەرز وەك نەڕە یا بۆڕە؛ دەنگەدەنگاوی.
(٢) [Colloq.]، زۆر سەرکەوتوو (بازرگانی)؛ گەرم (بازاڕ):
*( a ~ business)*

**roast** (rōst), ***v.t.*** (١) برژاندن (گۆشت، بەڕوو، کوێن)؛ گۆشت برژاندن.
(٢) پیشاندن؛ گۆشت پیشاندن (٣) ووشك کردنەوە یا برژاندن (قاوە).
(٤) زۆر گەرم کردن؛ دانەبەر گەرمای بەتین.
(٥) پوختەکردنی کانزای خاو بە تواندنەوەی لە کوورەدا.
(٦) خۆ گەرم کردنەوە لەبەر ئاگردان.
(٧) [Colloq.]، گاڵتەپێکردن یا ڕەخنەلێگرتن بە توندوتیژی (گەلێك جار لەڕووی برادەرێتییەوە هەر بۆ ڕابواردن).
***v.i.*** (١) گۆشت برژاندن؛ گۆشت پیشاندن. (٢) برژێنران؛ برژان؛ پیشان
(٣) زۆر گەرم بوون؛ داخ بوون.
***n.*** (١) گۆشتی برژاو؛ پارچەیەك گۆشتی برژاو یا پیشاو.
(٢) پارچەیەك گۆشتی ئامادەکراو یا بەکارهاتوو بۆ برژاندن یا پیشاندن
(٣) برژاندن؛ برژان؛ پیشاندن؛ پیشان.
(٤) [Colloq.]، سەیرانێکە کە گۆشتی تێدا ببرژێنرێت: *( a steak ~ )*
***adj.*** برژاو؛ پیشێنراو؛ برژێنراو: *( ~ beef)* .

**roaster** (rōs′tēr), ***n.*** (١) برژێنەر ( مرۆڤ، ئامێر).
(٢) تاوە یا دەفرێکی تری گۆشت تێدا پیشێنراو
(٣) مریشك یا بەچکە بەرازی بۆ برژاندن بەکارهاتوو

**rob** (rob), ***v.t.*** (١) ڕووتکردنەوە؛ ڕووتاندنەوە:
*( The thief ~bed me of my money.)*
(٢) لێ سەندن؛ لێ بێ بەش کردن: *( They ~bed us of our freedom.)*
(٣) برین (ماڵ، بانق): *( to ~ a bank)* .
(٤) تالان کردن؛ دزین؛ بە تالان بردن.
***v.i.*** ڕووتکردنەوە؛ دزین؛ دزێتی کردن.

**robalo** (rob′ə-lō′, rō′bə-lō′), ***n.*** جۆرە ماسییەکی دەریایی ئەمەریکاییە.

**roband** (rob′ənd), ***n.*** پەتی بایەوان پێ بەستنەوە.

**robber** (rob′ēr), ***n.*** جەردە؛ چەتە؛ خەڵك ڕووتکەرەوە؛ دز؛ ماڵ و شوێنی تر بڕ.

**robbery** (rob′ēr-i), ***n.*** جەردەیی؛ چەتەیی؛ چەتەگەری؛ ڕووتکردنەوە؛ دزی؛ ماڵ و شوێنی تر بڕین:
*( There are bank robberies every day.)*

**robe** (rōb), ***n.*** (١) عەبا (دادپرسی؛ قەشە؛ ئامەنگی دەرچوونی قوتابیانی زانکۆ)؛ جبە؛ کەوا؛ ڕۆب. (٢) ڕۆبی گەرماو یا خۆ ووشك کردنەوە.
(٣) کراسی ژنانەی ڕازاوە. (٤) ( *pl.* )، جل وبەرگ.
***v.t. & v.i.*** عەبا کردنەبەر؛ جبە، کەوا، یا ڕۆب لەبەرکردن.

**robin** (rob′in), ***n.*** سنگ زەردە؛ بووکە سوورە؛ باڵندەیەکی بچووکی

سنگ سووری مەیلەو زەردە ئەوەندەی چۆلەکەیەك دەبێت.

**roble** (rō'blā), *n.* داربەڕووی کالیفۆرنیا (گەڵاکەی جیرە وەك چەرمو بەڕووی باریکەڵەو نووك تیژ دەگرێ) ( پێشی دەووتری: " **white oak** ").

**roborant** (rob'ə-rənt), *adj.* بەهێزکەر (دەرمان)؛ هێ هێز.

*n.* دەرمانی هێز

**robot** (rō'bət, rob'ət), *n.* (١) مرۆڤی ئۆتۆماتیکی: مرۆڤی بە جەڕبەنگو خودکارە؛ مرۆڤی مەکینەیی.
(٢) کەسێکە کە هەر وەك مەکینە کاردەکاتو هیچ بیر ناکاتەوە؛ کەسێکی وەك مەکینە لێ هاتوو؛ واتا بێ بیر.

**-robotism** *(n.)*; **robotistic** *(adj.)*.

**robust** (rō-bust', rō'bust), *adj.* (١) بەهێز: بەهێزوبازوو: تێکسمراو: چوارشانە: *( a ~ young fellow)*.
(٢) سەخت: گران *( ~ labor)*.
(٣) (ا) قایم: بەهێز: بەرگەگر: *( a ~ plastic)*.
(ب) بەهێز: چەسپیو: قایم: *( a ~ faith)*
(٤) بێ پەردە: هەڵماڵراو *( ~ stories)*.
(٥) بەهێز: ئەڕوو *( ~ language)*
(٦) سەنگین و توندوتیژ: *( a ~ wine, coffe, etc.)*.

**-robustly** *(adv.)*; **robustness** *(n.)*.

**robustious** (rō-bus'chəs), *adj.* (١) بەهێز: تێکسمراو؛ چوارشانە.
(٢) دەنگ زل؛ نەختێك بێ نەزاکەتو دەنگەدەنگکەر

**roc** (rok), *n.* سیمرخ: باڵندەیەکی ئەفسانەیی یا قرتێکەوتووی زۆر بەهێزو گەورەیە

**rocambole** (rok'əm-bōl'), *n.* ڕووەکێکە لە سیر دەچێت.

**rochet** (roch'it), *n.* جبە یا عەبای سەرەك قەشە.

**rock** (rok), *n.* (١) بەرد؛ تەلەبەرد؛ تاشەبەرد؛ گابەرد؛ ووردە بەرد
(٢) شتێکی سەختو قایمو چەسپیو (پاڵپشت، بناغە، پشتیوان).
(٣) **rock fish** (٤) **rock dove**.
(٥) [Chiefly British]، جۆرە نوقوڵێکی ڕەقە.
(٦) [Slang] (ا) *(pl.)*، پارە؛ پارچەیەك پارە.
(ب) ئەڵماس: گەوهەرێکی وەك ئەڵماس.

**on the rocks,** (١) لە شکستیدایە؛ خەریکە تێکدەچێت یا دەفەوتێت؛ خەریکە هەرەس دەبات (مەجاز)؛ لە نەماندایە؛ شلۆقە: *( Their marriage is on the rocks.)*
(٢) نابووت: بێ پوولو پارە.
(٣) یەکسەر بە سەهۆڵەوە، واتا بەبێ ڕوونکردنەوە ( ویسکی): *( whisky on the rocks)*

**rock** (rok), *v.t.* (١) ڕاژەندن (لە بێشکە یا جۆلانێدا)؛ جۆلانێ پێکردن: *( She ~ed the baby to sleep.)*
(٢) ڕاوەشاندن: هێنانە لەرزین: *( The explosion ~ed the building.)*.
(٣) شڵەقاندن: شڵەژاندن: ئاسایش تێکدان: *( The scandal ~ed the town.)*
(٤) شۆردنەوەی کانزای خاو بە ڕاوەشاندنی.

*v.i.* (١) ڕاژەندن: ڕاژەنین: جۆلانێ پێکران. (٢) ڕاوەشان؛ لەرزین؛ لەرینەوە.
(٣) شۆرانەوەی کانزای خاو لە ڕاوەشێنەردا

*n.* (١) ڕاژەندن: ڕاژەنین (٢) لەرزین؛ لەرینەوە؛ لەرزەلەرز.

**rock-and-roll** (rok''n-rōl'), *n.* (١) مۆسیقای " ڕۆك ئەند ڕۆڵ "
(٢) سەمای " ڕۆك ئەند ڕۆڵ ".

**rockaway** (rok'ə-wā'), *n.* گالیسکەیەکی سووکی تەنیشت کراوەی چوارپێچکەیی‌یە

**rock bass,** ماسییەکی ڕوباری ئەمەریکییە

**rock-bottom** (rok'bot'əm), *adj.* زۆر نزم (نرخ)؛ زۆر هەرزان: *( ~ prices)*

**rock bottom,** بنی بنەوە؛ نزمترین پلە: *( He is at ~ psychologically and financially.)*

**rock-bound** (rok'bound'), *adj.* بە بەرد دەوری دراوە.

**rock cod,** جۆرە ماسییەکی بچووکە لە دەورووپشتی بەردا دەژی.

**rock crystal,** بلووری بەردین: جۆرە کریستاڵێکی ڕوونو بێ ڕەنگە.

**rock dove,** *Also* **rock pigeon,** کۆترە کێویلە.

**rocker** (rok'ēr), *n.* (١) بێشك ڕاژەن. (٢) کورسی ڕاژەندن.
(٣) ئەسپە دارینەی ڕاژەندن (بۆ سواربوونی منداڵان).
(٤) یەکێکە لەو دوو تەختەدارە چەماوەی بێشکە یا کورسی ڕاژەندنی لەسەر ڕادەژێنرێت. (٥) دەفرێکی لەرزۆکە بۆ شۆردنەوەو جیاکردنەوەی ئاڵتوون یا کانزای تر لە لمو خۆڵ. (٦) ئامێری ئامادەکردنی تەبەقە کانزا بۆ شت لەسەر هەڵکەندنی. (٧) [R-]، ئەندامی دەستەیەکی هەرزەی شەلاتی ماتۆرسکیل سواری ئینگلیزی.

**rockery** (rok'ēr-i), *n.* = **rock garden.**

**rocket** (rok'it), *n.* مووشەك؛ فیشەکە شێتە.

*v.i.* (١) وەك فیشەکە شێتە چوون بە ئاسماندا.
(٢) وەك فیشەکە شێتە چوون بە هەوادا (باڵندەی ڕاوکراوی هەڵسێنراو).

**rocket** (rok'it), *n.* (١) کووزەڵە.
(٢) ڕووەکێکی گوڵ سپیو پەمەییو زەردو ئەرخەوانییە.

**rocketeer** (rok'it-ēr'), *n.* مووشەکناس؛ مووشەك هاوێژ؛ زانای مووشەك دروستکردنو هاویشتن.

**rocket launcher,** مووشەك هاوێژ (ئامێر).

**rocketry** (rok'it-ri), *n.* مووشەکناسی؛ زانیاری مووشەك دروستکردنو هاویشتن.

**rockfish** (rok'fish'), *n.* ماسییەکە لە دەورووپشتی بەردا دەژی.

**rock garden,** باخچەی ناوبەرد: باخچەیەکە بە گوڵو بەرد ڕازێنرابێتەوە؛ گوڵستانێکە لە ناوچەیەکی بەردیندا . (پێشی دەووتری: " **rockery** ")

**rocking chair,** کورسی ڕاژێنە.

**rocking horse,** ئەسپە ڕاژێنە (بۆ سواربوونی منداڵان).

**rock oil,** [Chiefly British], نەوت؛ پەترۆڵ.

**rock pigeon,** = **rock dove.**

**rock-ribbed** (rok'ribd'), *adj.* (١) بەردین؛ بەردەڵانی؛ بەردانی.
(٢) سەرسەخت؛ ڕەق؛ نەگۆڕ؛ لەڕێی خۆ لانەدەر.

**rock salt,** بەردە خوێ.

**rock weed,** گیای بەسەر بەردەوە ڕواوی کەناری دەریا.

**rocky** (rok'i), *adj.* (١) بەردەڵانی؛ بەردانی؛ بەردەڵان.
(٢) بەردین؛ لە بەرد پێکهاتوو. (٣) (ا) چەسپیو وەك بەرد؛ قایم.
(ب) بێ بەزەیی؛ ڕەق؛ سەخت: *( a ~ heart)*.

**-rockiness** *(n.)*.

**rocky** (rok'i), *adj.* (١) شلۆق؛ لەرزۆك؛ دەلەرێتەوە: *( a ~ table)*.
(٢) [Slang]، گێژو بێ هێز؛ لەتر دەدات.

**-rockiness** *(n.)*.

**rococo** (rə-kō'kō), *n.* (١) شێوازێکی خانووسازیو جوانکارییە بریتییە لە ئەندازە بەدەر ڕازاندنەوەو نەخشو نیگار بەکارهێنان.
(٢) شێوازێکی وێژەیە بریتییە لە ڕازانەوەی لە ڕادە بەدەر.

*adj.* لە ئەندازە بەدەر ڕازاوە؛ زۆر نەخشو نیگاراوی (خانووسازی)؛ زەقو بێ تام.

**rod** (rod), *n.* (١) خەلف؛ توول؛ لق.
(٢) ئەوە؛ ڕەچە؛ لقی خێزانێك یا هۆزێك.
(٣) دار؛ شیش؛ میل: *( a curtain ~ )*.
(٤) (ا) داری دارکاری؛ داری فەلاقە. (ب) سزا؛ سزادان.
(٥) (ا) گورزی پاشا؛ گورزی فەرمانڕەوا.
(ب) دەسەڵات؛ فەرمانڕەوایی؛ زۆرداری؛ زۆردارەکی.
(٦) داری ڕاوەماسی: *( a fishing ~ )*.
(٧) باسك ( پێوان).
(٨) پێوانەیەکی پێنج یاردو نیوییە (بەتایبەتی بۆ زەوی)؛ میلی زەوی پێو
(٩) [Slang]، دەمانچە؛ دەمانچەی بەکرەدار.

(١٠) میكرۆبی درێژكۆله. (١١) شانەی درێژكۆلەی تۆڕی چاو.

**spare the rod,** سزا نەدان؛ لێ نەدان؛ داركاری نەكردن.

**rode** (rōd), *past tense and archaic p.p. of* **ride.**

**rodent** (rō′d'nt), ***adj.*** (١) كرۆژندە؛ قرتێنەر

(٢) تایبەتی بە كرۆژندەكان.

***n.*** گیانداری كرۆژندە یا قرتێنەر (مشك، كەروێشك، سمۆرە...هتد).

**rodeo** (rō′di-ō′), ***n.*** (١) گردكردنەوەی ڕەشەووڵاخ و مۆڵدانیان بۆ سمین و شتی وەها. (٢) مۆڵگەی ڕەشەووڵاخ؛ پەچە.

(٣) نوواندن یا بۆڕبۆڕێنێكی " كاوبۆی" ئەمەریكی‌یە كە بریتی‌یە لە سواری ئەسپ و كەڵەگای تۆڕو كەمەندكردنی پارێن و كەڵەگای تۆڕو شتی تری وەها.

**rodman** (rod′mən), ***n.*** باریدەدەری زەوی پێو (میلی زەوی پێوانەكە هەڵدەگرێت).

**rodomontade** (rod′ə-mon-tād′), ***n.*** فشە؛ فیشاڵ؛ قسەی زل؛ خۆهەڵكێشان؛ لاف وگەزاف.

***adj.*** فشەچی؛ فشەباز.

***v.i.*** گەزاف لێدان؛ فشەكردن؛ خۆهەڵكێشان؛ لاف لێدان.

**roe** (rō), ***n.*** گەرای ماسی

**roe** (rō), ***n.*** = **roe deer.**

**roebuck** (rō′buk′), ***n.*** نێرە ئاسك.

**roe deer,** *Also* roe, ئاسك؛ جۆرە ئاسكێكی بچووكە.

**roentgen** (rent′gən), ***n.*** ڕۆنتجن یەكەی پێوانەی تیشكی ئێكس.

**roentgenize** (rent′gə-nīz′), ***v.t.*** دانەبەر تیشكی ئێكس؛ تیشكی ئێكس لێدان

**roentgeno-** (rent′gən-ō, rent′gən-ə), پێشگرێكە بەمانای: تیشكی ئێكس

**roentgenogram** (rent′gən-ō-gram′), ***n.*** وێنەی تیشكی ئێكس

**roentgenography** (rent′gən-og′rə-fi), ***n.*** وێنەگرتن بە تیشكی ئێكس.

**roentgenology** (rent′gə-nol′ə-ji), ***n.*** تیشكی ئێكس ناسی؛ بەكارهێنانی تیشكی ئێكس بۆ دیاری كردن و چارەكردنی نەخۆشی.

**roentgenotherapy** (rent′gən-ō-ther′ə-pi), ***n.*** چارەكردنی نەخۆشی بە تیشكی ئێكس.

**rogation** (rō-gā′shən), ***n.*** (١) (*pl*) : نزاو نوێژو لە خودا پاڕانەوەی سێ ڕۆژ پێش یادی بەرزبوونەوەی عیسا بۆ ئاسمان (خاچ پەرستی).

(٢) (ا) پێشنیازكردنی گەلاڵەی یاسایەك لەلایەن فەرمانڕەوایەكی ڕۆمای كۆنەوە لەبەردەم جەماوەردا. (ب) گەلاڵەی ئەم یاسایە.

**Roger** (roj′ẽr), *interj. Also* **roger,** (١) ووتەیەكە لە پەیوەندی كردن بە دەزگای بێ تەلدا بەكاردەهێنرێت بەمانای " گەیشت" یا " وەرگیراوە"، واتە پەیامەكەت گەیشت یا وەرگیرا. (٢) [Slang]، باشە !؛ چاكە!؛ بەڵێ باشە!؛ نێ.

**rogue** (rōg), ***n.*** (١) كەسێكی دەربەدەر؛ خانە بە كۆڵ؛ وێڵ؛ بێ لانە؛ ڕەوەند (٢) دەغەڵ؛ كەسێكی بەدكارو پیس؛ پیاوخراپ؛ ناكەس.

(٣) قومارباز؛ كەڵەكباز؛ سەرسەری (لەڕووی گاڵتەوە)؛ كەتنباز.

(٤) گیاندارێكی چەمووش یا سەركێش بەتایبەتی فیلێك كە لە ڕەوەكەی دابڕابێت (٥) زیندەوەرێكی گەنكتر لە توخمەكەی (بەتایبەتی ڕووەك).

***v.t.*** (١) دەستبڕین؛ ساختەلێكردن؛ خەڵەتاندن؛ بە ساختە لێ كێشانەوە؛ گزی لێكردن (٢) لە ڕەگ دەرهێنان یا فەوتاندنی نموونە گەنكەكانی توخمە ڕووەكێك؛ بژاركردنی توخمی خراپ؛ بژاركردنی ڕووەكی خراپ یا گەنگ بۆ پاراستنی توخمەكەی.

***v.i.*** وێڵ بوون؛ ژیانێكی دەربەدەری و بێ لانەیی بردنەسەر؛ قوماربازی كردن.

**roguery** (rō′gə-ri), ***n.*** (١) ساختەچێتی؛ دەستبڕین؛ فێڵبازی؛ خەڵەتاندن (٢) قومارباذی؛ گۆبەنكاری؛ كەتنبازی.

**rogues' gallery,** وێنەی تاوانكاران لە پۆلیسخانەدا.

**roguish** (rō′gish), ***adj.*** (١) پیس؛ ناپاك؛ بێ ویژدان؛ دەغەڵ؛ ناكەس.

(٢) زۆڵ و قومارباز؛ جەربەزە؛ كەتنباز؛ هاروهاج؛ تەشقەڵەباز.

**roil** (roil), ***v.t.*** (١) لێڵ كردن (بە تێكهەڵدانی شلەو خڵتەكەی بنی).

(٢) تووڕەكردن؛ زویركردن؛ پەستكردن.

**roily** (roi′li), ***adj.*** (١) لێڵ. (٢) تووڕە؛ زویر؛ هەڵچوو؛ تەنگەجیكڵانە.

**roister** (rois′tẽr), ***v.i.*** (١) بە كەش وفشەوە ڕۆیشتن؛ خۆبادان؛ ڕۆزلێدان؛ كەشخەكردن (٢) بەزم گێڕان؛ كردن بە بەزم وڕەزم.

-**roisterer** ***(n.)***; **roisterous** ***(adj.)***.

**role** (rōl), ***n.*** (١) دەوری نوێنەرێكی شانۆنامەیەك: ***( the leading ~ )*** .

(٢) ڕۆڵ؛ دەور: ***( He played an important ~ in the rebellion.)*** .

**roll** (rōl), ***v.i.*** (١) (ا) خولانەوە؛ سووڕانەوە.

(ب) خل بوونەوە؛ گلۆربوونەوە؛ تەپاوتل كردن؛ تل دان.

(٢) گەڕان؛ سووڕانەوە.

(٣) تێپەڕین؛ ڕابوردن: ***( The years ~ed by.)*** .

(٤) خولانەوە (ئەستێرەی گەڕۆك، ئەستێرە).

(٥) شەپۆل دان؛ هەڵبەزودابەزی ئاو.

(٦) گرمەگرم هاتن؛ تەقینەوە: ***( Thunder ~s.)*** .

(٧) بەرزو نزم بوونەوەی دەنگ.

(٨) گرمۆڵەبوون؛ هەڵكڕان؛ لوول بوون؛ كلاڤەكردن:

***( The string ~ed into a tight ball.)***

(٩) هەڵگەڕانەوە (چاو): ***( Her eyes ~ed.)*** .

(١٠) (ا) بەملاو بەولادا كەوتن؛ لەنجەولاركردن: ***( The ship ~ed.)***

(ب) بە لەنجەولار ڕۆیشتن؛ لەنجەولاركردن.

(١١) پان بوونەوە لەژێر باگردێندا.

(١٢) بە ئاسانی و خێرا بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن: ***( Now we're ~ing.)*** .

(١٣) تەقلەلێدان؛ سەرمەقولات دان.

(١٤) خۆگەوزان؛ تەپاوتل كردن.

***v.t.*** (١) تل كردنەوە؛ خل كردنەوە؛ تلاندنەوە؛ تەپاوتل پێكردن؛ تل پێدان.

(٢) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە. (٣) تەپڵ لێدان خێرا خێرا.

(٤) زمان لوول دان لەكاتی بێژانی هەندێ تیپدا: ***( He ~s his r's.)*** .

(٥) خستنەكار (كامێرا)؛ خولاندنەوە (فیلمی كامێرا): ***( ~ the camera.)***

(٦) ڕاژەندن؛ لارەولارپێكردن؛ لەنجەولارپێكردن:

***( The waves ~ed the ship along.)***

(٧) هەڵگێڕانەوە: ***( She ~ed her eyes.)*** .

(٨) پێچانەوە؛ لوول دان؛ خڕ هەڵدان: ***( He ~ed a cigarette.)*** .

(٩) نان كردنەوە؛ پان كردنەوە (بە تیرۆك و شتی وەها).

(١٠) زار هەڵدان (تاوڵە و دۆمینە).

(١١) ڕاخستن؛ داخستن (بەڕە). (١٢) بابۆڵە كردن.

(١٣) [Slang]، ڕووتكردنەوەی سەرخۆشێك یا كەسێكی بێ دەسەڵات.

***n.*** (١) خل بوونەوە؛ تل بوونەوە؛ تل؛ تلاوتل كردن؛ تەقلە. (٢) لوولە (كاغەز).

(٣) شتی لوولەكراو (فیلمی كامێرا)؛ تۆپ (قوماش، كاغەز)؛ گورزە:

***( a ~ of film)***

(٤) لیستەی ناو. (٥) بابۆڵە (نان)؛ مارمارە.

(٦) بەكرە؛ باگردێن؛ خولخولۆكە.

(٧) لەنجە؛ لەنجەولار؛ لارەولار. (٨) تەپڵ لێدان.

(٩) دەنگدانەوە (هەورەگرمە، تۆپ تەقاندن)؛ گرمەگرم.

(١٠) بەرزو نزمی دەنگ.

(١١) بەرزایی زەوی؛ بەرزو نزمی زەمین.

(١٢) [Slang]، بابۆڵە (پارە)؛ سەفتە: ***( a ~ of ten dollar bills)*** .

**roll back,** (١) نرخ داشكان و گەڕاندنەوە بۆ ڕادەی نزمی جاران:

***( to roll back gas prices)***

(٢) گەڕاندنە دواوە؛ پاڵ پێوەنان بۆ دواوە.

**roll in,** (١) گەیشتن یا هاتن (بەتایبەتی ژمارەیەكی زۆر):

***( The tanks rolled in.)***

(٢) [Colloq.]، مەلە تێداكردن (مەجاز)؛ زۆر هەبوون (پارە):

***( He is rolling in money.)***

**roll out,** (١) پان کردنەوە؛ تەخت کردن.
(٢) ڕاخستن؛ داخستن ( بەڕە):
***( to roll out the red carpet for a guest)***
**roll round,** گەڕانەوە (وەرز):
***( Winter rolled round again.)***
**roll up,** (١) لوول کردن؛ پێچانەوە؛ گرموڵەکردن.
(٢) هەڵکردن (قۆڵ، پانتۆڵ): ***( Roll up your sleeves.)*** .
(٣) کەڵەکەکردن؛ کەڵەکەبوون؛ کۆمەڵ بوون؛ زۆربوون:
***( His debts were rolling up.)***
(٤) [Colloq.]، بە ئوتومبیل گەیشتن.
**rollback** (rōl′bak′), ***n.*** نرخ داشکان؛
گەڕانەوەی بۆ ڕادەی نزمی جاران.
**roll call,** ناو خوێندنەوە (قوتابی، سەرباز، کۆڕ)؛
بەسەرکردنەوە (بۆ ئەوەی بزانرێ کێ دیارەو کێیش دیار نییە).
**roller** (rōl′ēr), ***n.*** (١) بکەری roll (٢) بەکرە؛ خولخولۆکە
(٣) باگردێن. (٤) گوورزەی سارغی.
(٥) شەپۆلێکی زل هەڵئاوساو کە خۆی دەکێشێت بە کەناری دەریادا.
(٦) (ا) کۆتری تەقلەباز. (ب) باڵندەیەکە تەقلە لێدەدات لەکاتی فڕیندا.
**roller coaster,** هێڵێکی ئاسنی بەرزو نزمی پێچ پێچە گالیسکەی سەرکراوەی بچووکی بە تیژی بەسەردا دەڕوات خەڵك سواری دەبێت بۆ خۆشی لە باخچەی چەرخوفەلەکدا.
**roller-skate** (rōl′ēr-skāt′), ***v.i.*** لەسەر بەستەڵەك خلیسکان بە پێڵاوی پێچکەدارەوە.
**roller skate,** پێڵاوی پێچکەداری سەهۆڵ خلیسکێ.
**roll film,** فیلمی هەڵکراو لەسەر بەکرە؛ فیلمی کامێرا.
**rollick** (rol′ik), ***v.i.*** زەماوەندکردن؛ یاری کردن؛ خۆش ڕابواردن؛ بەزموڕەزم گێڕان.
***n.*** بەزموڕەزم؛ زەماوەند؛ یاری؛ ڕابواردن.
**rollicking** (rol′ik-iŋ), ***adj.*** خۆش (کات، ڕابواردن):
***( We had a ~ time.)***
**rollick-some** (rol′ik-səm), ***adj.*** = **rollicking.**
**rolling pin,** تیرۆك
**roll-over** (rol-ō′vēr), ***n.*** (١) هەڵگەڕانەوە؛ تەقلە؛ ئەم دیوو ئەودیو کردن. (٢) وەرگەڕان (ئوتومبیل).
**roly-poly** (rō′li-pō′li), ***adj.*** کورتو قەڵەو؛ پانوپۆڕ.
***n.*** (١) کەسێکی کورتەبنەو قەڵەو (بەتایبەتی منداڵ)؛ زیندەوەرێکی پانوپۆڕ.
(٢) [Chiefly British]، جۆرێکە لە کێك.
**Romaic** (rō-mā′ik), ***adj.*** (١) هی یۆنانی نوێ.
(٢) هی زمانی یۆنانی نوێ.
***n.*** زمانی یۆنانی نوێ
**romaine** (rō-mān′), ***n. Also*** **romaine lettuce,** کاهوو
**Roman** (rō′mən), ***adj.*** (١) ڕۆمانی؛ تایبەتی بە ڕۆمای کۆنو تازەو دانیشتووەکانی (٢) کاسۆلیکی
(٣) [r-]، هی جۆرە تیپێکی ڕاستو باریکەڵەیە (چاپەمەنی).
***n.*** (١) نیشتەجێیەکی ڕۆمای کۆن یا تازە؛ هاونیشتمانییەکی ڕۆمانی.
(٢) زمانی ئیتاڵی شاری ڕۆما. (٣) لاتینی؛ زمانی لاتینی.
(٤) کەسێکی کاسۆلیکی.
(٥) [r-]، جۆرە تیپێکی ڕاستو باریکەڵەیە (چاپەمەنی).
**roman à clef** (rô′män′ nå klā′), [Fr.], چیرۆکێکە دەربارەی خەڵكو ڕووداوی ڕاستەقینە کە ناوو شتی تری دەگۆڕدرێ بۆئەوەی خەڵكو شوێنەکان نەناسرێنەوە
**Roman alphabet,** ئەلفوبێی ڕۆمانی کۆن (کە زۆربەی ئەلفوبێی زمانە تازەکانی ئەورووپای لێوە وەرگیراوە).
**Roman candle,** جۆرێکە لە فیشەکە شێتە.
**Roman Catholic,** (١) هی کڵێسەی کاسۆلیکی.
(٢) کەسێکی کاسۆلیکی.
**Roman Catholic Church,** کڵێسەی کاسۆلیکی.
**Roman Catholicism,** ئاینی کاسۆلیکی.
**Romance** (rō-mans′, rō′mans), ***adj.*** تایبەتی بەو زمانانەی کە لە لاتینییەوە وەرگیراون وەك ئیسپانی، پورتوغالی، فەرەنسی، ئیتاڵیو چەند زمانێکی تر: ***( ~ languages.)*** .
***n.*** ئەم زمانانە.
**romance** (rō-mans′), ***n.*** (١) ڕۆمانس: چیرۆکێکی هۆنراوەیی یا پەخشانی کۆنە دەربارەی دڵداریو کرداری ئازایانەو جوامێرانەی سوراچاکان.
(٢) چیرۆکێکی دڵداریو کرداری جەربەزانە.
(٣) وێژەی لەم جۆرە چیرۆکە پێکهاتوو.
(٤) هەستی دڵداریو کاری خۆشیو جەربەزانە؛ خۆشی ئەم جۆرە هەستە.
(٥) زیادەڕۆیی؛ شت هەڵبەستن؛ درۆزنی؛ درۆزنەیی.
(٦) دڵداری؛ خۆشەویستی. (٧) پارچەیەك مۆسیقای دڵداری.
***v.i.*** (١) " ڕۆمانس" نووسین؛ چیرۆکی دڵداری نووسین یا گێڕانەوە.
(٢) بە زمانی دڵدارانە دووان.
(٣) زیاد ڕۆیشتن لە بیرکردنەوەو خەیاڵ لێداندا.
(٤) [Colloq.]، دڵداری کردن؛ چاوباشقاڵی کردن؛ دەستبازی کردن؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان.
***v.t.*** [Colloq.], دڵداری لەگەڵ کردن؛ دەستبازی کردن؛ هەوڵی دڵ ڕاکێشان دان.
**Roman Empire,** ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی؛ شاهەنشانشینی ڕۆمانی.
**Romanesque** (rō′mə-nesk′), ***n.*** (١) شێوازێکی خانووسازییە لە سەدانی یانزەو دوانزەدا باوبوو بریتییە لە بەکارهێنانی تاقی خڕو گومەزو دیواری زۆر ئەستوور. (٢) شێوازێکی نیگارکێشی وەك ئەمە.
***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە شێوازی خانووسازیو نیگارکێشییە.
**Romanian** (rō-mā′ni-ən, rō-mān′yən), ***adj.*** تایبەتی بە گەلو زمانو کلتووری ڕۆمانیا؛ ڕۆمانیایی.
***n.*** (١) هاونیشتمانییەکی ڕۆمانیا؛ ڕۆمانیایی. (٢) زمانی ڕۆمانیایی
**Romanize** (rō′mən-īz′), ***v.t.*** (١) کردن بە ڕۆمانی؛ وەك ڕۆمانی لێکردن. (٢) کردن بە کاسۆلیك؛ وەرگەڕاندن بۆ ئاینی کاسۆلیکی
(٣) گۆڕین بۆ ئەلفوبێی ڕۆمانی، واتە لاتینی؛ بە تیپ یا ئەلفوبێی ڕۆمانی نووسین.
***v.i.*** (١) وەرگرتن یا پەیڕەوکردنی نەریتو یاسای ڕۆمانی.
(٢) بوون بە کاسۆلیك.
**Roman numerals,** ژمارەی ڕۆمانی.
**( I = 1, II = 2, M = 1000, C = 100, X = 10, V = 5 ).**
**romantic** (rō-man′tik), ***adj.*** (١) ڕۆمانتیکی:
***( a ~ story, scene, etc.)***
(٢) خەیاڵی؛ ناکردەنی؛ خەیاڵ پلاوی: ***( a ~ idea, scheme, etc.)***
(٣) ڕۆمانتیکی؛ هەستی ڕۆمانتیکی هەیە؛ حەز لە دڵداریو شوێن خەیاڵ کەوتن دەکات: ***( a ~ girl, youth, man, etc.)*** .
(٤) هەستی ڕۆمانتیکی یا دڵداریو خەیاڵی خۆش دروستکەر:
***( a ~ place, atmosphere, etc.)***
(٥) ڕۆمانتیکی: تایبەتی بە بزووتنەوەی ڕۆمانتیکی لە وێژەو هونەردا.
***n.*** (١) کەسێکی ڕۆمانتیکی؛ کەسێکی هەست ناسكو حەز لە دڵداریو خەیاڵ کەر. (٢) پەیڕەویکەری ڕێبازو شێوازی ڕۆمانتیکی لە وێژەو هونەردا.
(٣) (*pl.*) ، هەست و نیشانەی ڕۆمانتیکی.
-romantically ***(adv.).***
**romanticism** (rō-man′tə-siz'm), ***n.*** (١) هەستی ڕۆمانتیکێتی؛ ڕۆمانتیکێتی؛ هەستو ڕەوشتو کردەوەو هەڵوێستی ڕۆمانتیکی، واتە دڵداریو شوێن خەیاڵو هەست کەوتنو ناکردەنێتی.
(٢) [R-]، بزووتنەوەی ڕۆمانتیکی: ڕێبازو شێوازێکە لە وێژە (بەتایبەتی لە هۆنراوەو هونەردا) لە دوادوای سەدەی هەژدەهەمو سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەی سەند دژی " کلاسیکی نوێ" وە بریتی بوو لە خۆ ڕزگارکردن لە

شێوازو باسی کۆنو پەڕپووتو گوێ دان بە هەستی هونەرو سرووشت.
**romanticist** (rō-man′tə-sist), ***n.*** ڕۆمانتیکی؛ پەیڕەویکەری
فەلسەفەی ڕۆمانتیکی لە وێژەو هونەردا (ووشەی پێشوو ببینە).
**romanticize** (rō-man′tə-sīz′), ***v.t.*** بەرگی ڕۆمانتیکی لەبەرکردن؛
بە ڕۆمانتیکیانە نواندن یا پیشاندان.
***v.i.*** بیری ڕۆمانتیکی کردنەوە؛ ڕۆمانتیکیانە بیرکردنەوە یا شت بینین.
**Romany** (rom′ə-ni), ***n.*** (۱) قەرەج؛ کاولی (۲) زمانی قەرەجەکان.
***adj.*** قەرەجی؛ تایبەتی بە قەرەجەکانو زمانەکەیان.
**Romish** (rōm′ish), ***adj.*** کاسۆلیکی (لەڕووی سووکییەوە).
**romp** (romp), ***n.*** (۱) یاریو سەماو گاڵتەوگەپ؛
یاریو سەماکردنو ڕابواردنو تریقو هووڕ. (۲) کچی حەز لە یاری کەر؛
کچو منداڵی یاریکەر. (۳) [Slang]، غارغارێن بردنەوە بە ئاسانی؛
پێشبڕکێ بردنەوەی ئاسان (ئەسپ).
***v.i.*** (۱) یاریو سەماو گاڵتەوگەپ کردن (بەتایبەتی کچو منداڵ).
(۲) [Slang]، غارغارێن بردنەوە بە ئاسانی.
**romper** (rom′pēr), ***n.*** (۱) منداڵی یاریکەر؛ یاریو سەماکەر
(بەتایبەتی کچو منداڵ). (۲) (*pl.*)، بەرگی سەرتاپای یاری منداڵان.
**rompish** (rom′pish), ***adj.*** حەز لە یاری کەر (کچو منداڵ).
**rondeau** (ron′dō, ron-dō′), ***n.*** (۱) هەڵبەستێکی سیانزە دێڕی
دوو کێشەیییە (وە هەندێ جاریش دە دێڕییە). (۲) rondo .
**rondel** (ron′d'l, ron′del), ***n.*** پارچە هەڵبەستێکی چواردە دێڕییە.
**rondo** (ron′dō, ron-dō′), ***n.*** پارچەیەك مۆسیقایە کە ئاوازە
سەرەکییەکەی ناوبەناو دووبارە دەکرێتەوە.
**rondure** (ron′jēr), ***n.*** [Poetic], (۱) بازنە؛ ئەڵقە؛ چەمەری
(۲) خڕی؛ بازنەیی؛ ئەڵقەیی.
**rontgen** (ront′jən), ***n.*** = **roentgen.**
**rood** (rōōd), ***n.*** (۱) ئەو سێدارەیەی عیسای پێوە هەڵواسرا.
(۲) خاچ (هی ناو کڵێسە یا هەر شوێنێکی تر).
(۳) پێوانەیەکی ئینگلیزییە بریتییە لە پێنج یاردو نیو هەتا هەشت یارد.
(٤) پێوانەیەکی ڕووی زەوییە بریتییە لە چواریەکی " ئەیکەر" یا
بانەگایەك (" ئەیکەر" یەك چوارهەزارو چلوهەشت مەترە دووجایە).
**roof** (rōōf, roof), ***n.*** (۱) سەربان (۲) ماڵ؛ لانە
(۳) پۆپە؛ تەوقەسەر؛ سەر ***( the ~ of the world)*** .
(٤) ئاسمانەی دەم؛ سەر ***( the ~ of the mouth; the ~ of a bus)*** .
***v.t.*** سەربان بۆ کردن؛ سەرگرتن (خانوو)؛ سەربان گرتن.
**go through ( or hit, or raise ) the roof,** (۱) کردن بە هەرا
(چەپڵەلێدان. ئاهەنگ، تووڕەیی). (۲) زۆر تووڕەبوون؛ زۆر سکاڵاکردن بە
دەنگی بەرز
**under a person's roof,** لە ماڵی یەکێکدا بوون (میوانداری؛ دانەدان).
**under one roof,** لە هەمان ماڵدا؛ لە هەمان شوێندا.
**roofer** (rōōf′ēr, roof′ēr), ***n.*** وەستا یا کرێکاری سەربان؛
سەربان چاککەر یا درووستکەر.
**roofing** (rōōf′iŋ, roof′iŋ), ***n.*** (۱) سەربان درووستکردن یا
چاککردن؛ سەرگرتنی خانوو. (۲) سەربان. (۳) کەرەسەی سەربان؛ داروپەردوو.
**roofless** (rōōf′lis, roof′lis), ***adj.*** (۱) بێ سەربان.
(۲) لانەواز؛ دەربەدەر؛ بێ ماڵو شوێن؛ بێ لانە.
**rooftree** (rōōf′trē′, roof′trē′), ***n.*** (۱) نیرگە (۲) سەربان.
(۳) ماڵ؛ لانە.
**rook** (rook), ***n.*** (۱) قەلەڕەشکە؛ قاژ؛ قاژوو.
(۲) گزیکەر؛ ساختەچی (قومار).
***v.t. & v.i.*** گزی کردن؛ ساختەکردن (قومار).
**rook** (rook), ***n.*** قەلا (شەترەنج)
**rookery** (rook′ēr-i), ***n.*** (۱) شوێنی هێلانەکردنو بەچکەکردنی قاژوو؛
هێلانەخانەی قەلەڕەش.
(۲) مۆنگەی هەندێ گیاندار وەك مانگای دەریا؛ هێلانەخانەی پەنگوین.
(۳) خانوویەکی پەڕپووتی گەورەکێکی هەژار کە چەند خێزانێکی تێدا دەژی
**rookie** (rook′i), ***n.*** (۱) سەربازی تازە گیراو.
(۲) یاریکەری تازە ( بێسبوڵ).
(۳) نەوکار؛ نوێکار؛ تازەکوورە؛ فەریك؛ نەشارەزا.
**rooky** (rook′i), ***adj.*** پڕە لە قاژ.
**room** (rōōm, room), ***n.*** (۱) جێ؛ شوێن؛ جێگەوڕێگە:
***( We have enough ~ for one more person in our house.)***
(۲) بووار؛ دەرفەت؛ ڕێ؛ جێ؛ بۆ هەبوون؛ هەل:
***( There's ~ for improvement in your work.;***
***There is ~ for doubt.)***
(۳) ژوور؛ هۆدە.
(٤) (*pl.*) ، شوێنی ژیان؛ خانە.
(٥) ئەوانەی لە ژوورێکدان؛ خەڵکی ناو ژوورێك:
***( The whole ~ was silent.)***
***v.i.*** تێدا ژیان؛ تێدا دانیشتن یا نیشتەجێ بوون؛ تێدابوون.
***v.t.*** جێکردنەوە؛ جێگەوڕێگە پێدان؛ لانە پێدان.
**make room,** جێکردنەوە؛ جێ بۆ چۆڵ کردن؛ ڕێ دان:
***( Make room for the guests.)***
**room and board,** خواردنو نوستن (بە پارە یا بەخۆڕایی لە
شوێنێکدا): ***( The school provides ~ for free.)*** .
**roomer** (rōōm′ēr, room′ēr), ***n.*** = **lodger.**
**roomette** (rōōm-et′, room-et′), ***n.*** ژوورێکی بچکۆلەی نوستن
لە فارگۆنی شەمەندەفەردا.
**roomful** (rōōm′fool′, room′fool′), ***adj.*** (۱) پڕ ژوورێك؛
ئەوەندەی ژوورێك بیگرێت (مرۆڤ، شت).
(۲) سەرجەمی ئەو کەسانە یا شتانەی لە ژوورێکدان؛ خەڵكو شتی ناو ژوورێك.
**roominess** (rōōm′i-nis, room′i-nis), ***n.*** فراوانی یا گەورەیی
شوێنێك (ژوور، خانوو، کورسی، ڕاڕەو).
**rooming house,** خانوویەکە ژوورەکانی بە جیاجیا دراین بەکرێ.
(پێشی دەوترێ " loding house " ).
**roommate** (rōōm′māt′, room′māt′), ***n.*** هاوژوور؛ هاوماڵ؛
هاونشین.
**roomy** (rōōm′i, room′i), ***adj.*** فراوان؛ گەورە:
***( a ~ apartment, house, place, etc.)***
**roorback, roorbach** (roor′bak), ***n.*** بوختان یا درۆودەلەسە
هەڵبەستن (بەتایبەتی بۆ ناوزڕاندن لە هەڵبژاردنێکدا).
**roost** (rōōst), ***n.*** (۱) (ا) شوێنی نیشتنی مریشكو کەڵەشێرو باڵندەی تر.
(ب) نیشتنگای باڵندە؛ جێیەکە کە شوێنی گەلێك باڵندەی تێدابێتەوە بۆ
نیشتن. (۲) ئەو کۆمەڵە مریشكو کەڵەشێر یا باڵندەیەی تر کە پێکەوە دەنیشن.
(۳) لانە؛ خانە.
***v.i.*** (۱) نیشتن (مریشكو کەڵەشێرو باڵندەی تر).
(۲) حەوانەوە (بۆ شەوێك)؛ جێی خۆ خۆش کردن بۆ شەوێك.
**come home to roost,** هاتنەوە ڕێگەی کارێکی خراپ بۆ ئەو کەسەی
کردارەکە دەکات؛ بە زیان گەڕانەوەی کارێکی خراپ بۆ کەسەکە خۆی
**rule the roost,** جڵەو بە دەستەوە بوون؛ سەرگەورەیی کردن؛
ئیشوکاری کۆمەڵێك بە دەستەوە بوون.
**rooster** (rōōs′tēr), ***n.*** کەڵەشێر؛ کەڵەباب.
**root** (rōōt, root), ***n.*** (۱) ڕەگ؛ بنج؛ ڕیشە.
(۲) ڕەگ (ددان، قژ)؛ بنج.
(۳) سەرچاوە؛ ڕەگو ڕیشە؛ بنجو بناوان؛ بناغە؛ بنچینە:
***( the ~ of the problem; to get to [ at ] the ~ of the matter)***
(٤) بنەچە؛ بنو بنچینە؛ باوباپیر.
(٥) ڕەگی ووشە (زمانەوانی): ***( the ~ of verb)*** .
(٦) ڕەگ (بیرکاری): ***( 4 is the square ~ of 16 .)*** .
**put down roots,** = **take root.**

**root and branch,** هەمووی بە تەواوی.
**root out ( or up ),** لە ڕەگو ڕیشە دەرهێنان؛ بنەبڕکردن؛
بە تەواوی فەوتاندن یا نەهێشتن.
**take root,** (١) ڕەگ داکوتان؛ ڕووان؛ بنج بەستن؛ بنج داکوتان؛ خۆگرتن.
(٢) چەسپین؛ جێی خۆ گرتن؛ جێگیربوون.
**root** (rōōt, root), *v.t.* بە لمۆز هەڵکەندن (بەراز).
*v.i.* **( ~ through),** (١) بۆ گەڕان؛ پشکنین؛ پێداگەڕان.
(٢) [Colloq.]. کۆشش کردن بۆ پارە پەیداکردن؛ ئیش زۆر کردن.
(٣) [Slang] ( ~ **for** )، هاندان و چەپڵە بۆ لێدانی تیپێکی یاری یا
پێشبڕکێکەرێک *( to ~ for a team)* .
(٤) [Slang] ( ~ **for** )، پشت گرتن؛ پاڵپشتی کردن؛ یارمەتیدان:
*( to ~ for a candidate)*
**rootage** (rōōt′ij, root′ij), *n.* (١) ڕەگ داکوتان؛ بنج داکوتان؛
جێگیربوون؛ چەسپین. (٢) ڕەگ؛ ڕەگەکانی ڕووەکێک.
**root beer,** خواردنەوەیەکە لە ڕەگی هەندێ ڕووەک دروست دەکرێ.
**rootlet** (rōōt′lit, root′lit), *n.* ڕەگۆلکە؛ ڕەگی بچکۆلە.
**rootstalk** (rōōt′stôk′, root′stôk′), *n.* = **rhizome.**
**rootstock** (rōōt′stok′, root′stok′), *n.* (١) ڕەگی متوربەکردن.
(٢) **rhizome**
**rooty** (rōōt′i, root′i), *adj.* (١) ڕەگاوی؛ ڕەگی زۆرە.
(٢) ڕەگی؛ لە ڕەگ دەچێت.
**rope** (rōp), *n.* (١) گوریس؛ پەت؛ تەناف.
(٢) (*pl.*) تەنافی مەیانی بۆکسبازی. (٣) پەتی سێدارە.
(٤) هەڵواسین؛ کردن بە سێدارەدا.
(٥) **lasso**.
(٦) شتێکی وەك پەت؛ زنجیرە؛ ڕیز: *( a ~ of pearls)* .
*v.t.* (١) بە گوریس یا بە پەت بەستنەوە؛ بەستنەوە.
(٢) پێکەوە بەستنەوە (شاخەوانی).
(٣) ( ~ **in** ; ~ **off** ; ~ **out** )، بە تەناف دەورگرتن؛ تەناف بەدەوردا گێڕان.
(٤) کەمەندکردن: گرتنەوەی ئەسپ و ڕەشەووڵاخی بەڕەڵا بە پەتی قوڵفدار.
**give one rope,** [Colloq.], پەت بۆ شل کردن؛ ڕێ بۆ بەرەڵاکردن؛
سەربەستی پێدان لە ئیش کردندا.
**know the ropes,** [Colloq.], شارەزای شتێك یا ئیش وکارێك بوون
بە تەواوی؛ زۆر لێ زانین؛ هەمووشت فێربوون دەربارەی کارێك.
**rope in,** [Slang], هەڵفریوان؛ ڕاکێشان؛ بەفریودان.
**the end of one's rope,** هیوا بڕاو؛ بێ هیوا؛ ناچار؛ پەرێشان؛
هیچ بە دەستەوە نەماو: *( He is at the end of his rope.)* .
**ropedancer** (rōp′dan′sẽr, rop′dän′sẽr), *n.* تەنافباز
**ropy** (rōp′i), *adj.* (١) لینج (٢) گوریسی؛ تەنافی.
**roque** (rōk), *n.* ڕۆك: یارییەکە بە تۆپی تەختە دەکرێت
**roquet** (rō-kā′), *v.t. & v.i. & n.* لە تۆپی یاریکەرێکی تر دان.
**rosaceous** (rō-zā′shəs), *adj.* (١) گوڵی؛ لە توخمی گوڵە.
(٢) لە گوڵ دەچێت؛ گوڵی؛ گوڵ ئاسا. (٣) پەمەیی.
**rosary** (rō′zə-ri), *n.* (١) گوڵستان؛ گوڵزار؛ گوڵدان. (٢) تەزبیح.
(٣) (ا) تەزبیحی نزاکردن. (ب) [R-]، نزای بە تەزبیح کراو.
**rose** (rōz), *n.* (١) گوڵەباخ؛ گوڵ. (٢) ڕووەکی گوڵ ئاسا.
(٣) ڕەنگی پەمەیی و پەمەیی تۆخ و سوور. (٤) ڕەنگی کوڵمی سوور.
(٥) **rosette** (٦) بۆنی گوڵاوی؛ گوڵاو؛ بۆن. (٧) ئاوپژێن؛ گوڵاوپژێن.
(٨) ئەڵماس. (٩) **compass card** . (١٠) **rose window** .
*adj.* پەمەیی؛ پەمەیی تۆخ؛ سوور.
**bed of roses,** خۆش گوزەرانی؛ تێروتەسەلی؛ ژیانی خۆش و ئاسوودە.
**under the rose,** بە دزییەوە؛ بە نهێنی؛ بە پەنهانی.
**rose** (rōz), *past tense of* **rise.**
**roseate** (rō′zi-it, rō′zi-āt′), *adj.* (١) پەمەیی؛ ڕەنگ پەمەیی.
(٢) گوڵی؛ لە گوڵ پێکهاتوو؛ بە گوڵ کراو.

(٣) خۆشبین؛ بەرچاو ڕووناك؛ دەم بە پێکەنین.
**rose-bay** (rōz′bā′), *n.* (١) ژاڵە.
(٢) جۆرە دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێ.
**rose-bud** (rōz′bud′), *n.* خونچە؛ خونچە گوڵ.
**rose-bush** (rōz′boosh′), *n.* دار گوڵەباخ؛ دارگوڵ؛ گوڵەباخ.
**rose-colored** (rōz′kul′ẽrd), *adj.* (١) پەمەیی؛ ڕەنگ پەمەیی.
(٢) خۆشبین؛ بەرچاو ڕووناك؛ خۆش بینراو.
**rose fever,** نەخۆشی هەستیاری لە بۆنی هەڵاڵەی گوڵەوە تووش بوو
(دەبێتە هۆی پژمین و هەناسەتەنگی و ئاو بە لووت و چاودا هاتنەخوارەوە).
**rose-fish** (rōz′fish′), *n.* ماسییەکی دەریایی پرتەقاڵی سوورکارە.
**rosemary** (rōz′mâr′i, rōz′mẽr-i), *n.* بنچکێکی هەمیشە سەوزی
بۆن خۆشە لە توخمی جاترە گەڵاکانی دەزوولەیین دەکرێنە چێشتەوە و بۆنی
خۆشیشیان لێ دەردەهێنرێت.
**roseola** (rō-zē′ə-lə), *n.* گەرمەژنە؛ سوورێژەی ئەڵمانی.
**rosery** (rōz′ẽr-i), *n.* گوڵستان؛ گوڵزار.
**rosette** (rō-zet′), *n.* (١) گوڵبەند (بۆ بە یەخەدا کردن لە شریت و شتی
وەها دروست دەکرێ)؛ یەخەبەندی گوڵ ئاسا.
(٢) شتێکی ڕازێنەرەوە لە شێوەی گوڵدا.
(٣) نەخش ونیگاری گوڵ گوڵی (خانووسازی).
(٤) کۆپەرە (ڕووەکناسی).
**rose water,** گوڵاو.
**rose window,** پەنجەرەی گوڵی: پەنجەرەیەکی خڕە شووشەیەکی
بە نەخشی گوڵی ڕازاوەتەوە.
**rosewood** (rōz′wood′), *n.* (١) تەختەی پەمەیی: تەختەیەکی ڕەق و
بەنرخی سوورکارە لە هەندێ درەختی ناوچە گەرمەکان دەست دەکەوێت
کەرەسەی ناوماڵی لێ دروست دەکرێت. (٢) درەختی ئەم تەختەدارە.
**rosily** (rō′z′l-i), *adv.* (١) بە ڕووخۆشی؛ بە دەم بە پێکەنینەوە؛
بە خۆشییەوە. (٢) بە ڕەنگی پەمەیی.
**rosin** (roz′′n, roz′in), *n.* جەوی یا ڕێسینی سنەوبەر بۆ چەورکردنی
کەوانەی کەمانچە و بۆیە دروستکردن بەکاردێت.
*v.t.* چەورکردن بەم جەوییە.
-rosiny *(adj.).*
**rosiness** (rō′zi-nis), *n.* (١) پەمەییێتی. (٢) گەشی؛ پڕ هیوایی؛
جوانی و باشی (بار یا دۆخی شت). (٣) گوڵ ئاسایەتی.
**rosinweed** (roz′′n-wēd′, roz′in-wēd′), *n.* گیای جەویدار.
**rostellate** (ros′tə-lāt′, ros′tə-lit), *adj.* دەنووکی بچکۆلەدار.
**rostellum** (ros-tel′əm), *n.* ئەندامێکە لە دەنووکی بچووك دەچێت
(لە هەندێك جانەوەری ووردو گوڵدا).
**roster** (ros′tẽr), *n.* (١) لیستەی ناو (قوتابخانە...هتد).
(٢) لیستەی ناوی ئەفسەرو سەرباز.
**rostrate** (ros′trāt), *adj.* لمۆزدار؛ دەنووکدار.
**rostrum** (ros′trəm), *n.* (١) (ا) لووتی کەشتی جەنگی ڕۆمانی کۆن
(بۆ لێدانی کەشتی دوژمن). (ب) دوانگای گشتی کۆنی ڕۆما (کە بە لووتی
کەشتی داگیرکراوی دوژمن دەڕازێنرایەوە).
(٢) (ا) دوانگا. (ب) دوانگەی ئاینی.
(ج) ووتاربێژی.
(٣) دەنووك؛ لمۆز؛ ئەندامی دەنووك ئاسایی (لە گیانداروڕووەکدا).
**rosy** (rō′zi), *adj.* (١) پەمەیی؛ سوور؛ لە گوڵ دەچێت: *( ~ cheeks)* .
(٢) گوڵی؛ گوڵ گوڵی؛ بە گوڵ ڕازاوە.
(٣) گەش؛ خۆشبین؛ پڕ هیوا؛ ڕووناك:
*( a ~ future ; ~ expectations ; to paint a ~ picture of life)*
**rot** (rot), *v.i.* (١) گەنین؛ بۆگەن کردن؛ بۆن کردن؛ داوەشان.
(٢) ( ~ **off** ; ~ **away** )، ڕزین؛ داڕزان؛ داڕزین؛ ڕزان؛ ڕووکانەوە.
(٣) پیس و بۆگەن بوون (ڕەووشت، کردار...هتد)؛ بەناخداچوون.
*v.t.* (١) بۆگەن کردن؛ داڕزاندن؛ ڕزاندن؛ داوەشاندن.

(٢) **ret**
*n.* (١) گەنین؛ ڕزین؛ ڕزان؛ داوەشان؛ بۆگەن کردن.
(٢) شتی گەنیو؛ شتی بۆگەن کردوو؛ شتی داڕزاو.
(٣) نەخۆشی‌یەکی مەڕومالاتە دەبێتە هۆی پووکانەوە.
(٤) نەخۆشی‌یەکی ڕووەکە دەبێتە هۆی کەڕوو هەڵهێنان‌و گەنین.
(٥) [Slang]. قسەی هیچ‌وپووچ؛ قسەی قۆڕ.

**rota** (rō′tə), *n.* (١) نۆرە؛ نۆرەکردن
(٢) **roster** (٣) [R-]، دادگای پیاچوونەوەی کلێسەی کاسۆلیکی.

**rotarian** (rō-târ′i-ən), *n.* ئەندامی یانەی " ڕۆتەری".
(دووەم ووشەی دواوە سەیرکە).

**rotary** (rō′tə-ri), *adj.* سووڕاوە؛ خولاوە؛ بە دەوری تەوەردا سووڕاوە یا خولاوە؛ گەردوخول: *( ~ motion)* .
*n.* مەکینەی سووڕاوە؛ پارچەی خولاوە.

**Rotary club,** یانەی ڕۆتەری ڕێکخراوێکی جیهانی‌یە زۆربەی ئەندامەکانی بازرگان‌و پیشەگەرانن ساڵی ١٩٠٥ لە " شیکاگۆ " دامەزرێنرا بۆ خزمەتی ئەندامەکانی‌و پەرە پێ سەندنی لەیەکتر نزیکبوونەوەی گەلان.

**rotary engine,** مەکینەی سووڕاوە؛ مۆتۆڕی خولاوە.

**rotate** (rō′tāt), *v.i.* (١) سووڕانەوە (بەدەوری تەوەردا)؛ خولانەوە؛ سووڕخواردن: چەرخان. (٢) نۆرەکردن؛ نۆبەکردن؛ جێگۆڕکێ کردن.
*v.t.* (١) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە؛ سووڕپێدان؛ چەرخاندن.
(٢) نۆرەپێکردن؛ نۆبەپێکردن؛ جێگۆڕکێ پێکردن:
*( They ~d the troops.; The farmer ~d crops.)*
*adj.* چەرخی (وەك کۆبەڕەی هەندێ گوڵ).
**-rotatable** *(adj.)*.

**rotation** (rō-tā′shən), *n.* (١) سووڕانەوە؛ خولانەوە؛ گەردوخول:
*( the daily ~ of the earth )*
(٢) خول؛ سووڕ؛ یەك خول.
(٣) نۆرە؛ نۆبە؛ جێگۆڕکێ؛ نۆرەکاری: *( a ~ of duties)* .
**-rotational** *(adj.)*.

**rotative** (rō′tə-tiv), *adj.* (١) گەردوخولی؛ سووڕاوەیی؛ خولاوەیی؛ خولاوە. (٢) بە نۆرە کراو؛ بەرودوایی.

**rotator** (rō′tā-tẽr, rō-tā′tẽr), *n.* خولێنەرەوە (بەتایبەتی ماسولکەیەکە کە ئەندامێکی لەش دەخولێنێتەوە)؛ سووڕێنەرەوە.

**rotatory** (rō′tə-tôr′i, rō′tə-tō′ri), *adj.* (١) خولاوە؛ سووڕاوە؛ گەردوخولی. (٢) خولێنەرەوە؛ سووڕێنەرەوە.
(٣) نۆبەکار؛ بەرودوا هاتوو؛ نۆرەکار.

**rote** (rōt), *n.* (١) لەبەرکردن بەبێ تێگەیشتن؛ دەرخ کردن:
*( to learn by ~ )*
(٢) ڕۆتین: لەسەر یەك شێواز.

**by rote,** لەبەر: کردنی شتێك بە ڕۆتین‌و بەبێ بیرلێکردنەوە:
*( to do something by rote)*

**rote** (rōt), *n.* دەنگی شەپۆل شکانەوە؛ هاژەهاژی شەپۆل کێشان بە قەراغی دەریادا.

**rote** (rōt), *n.* ئامێرێکی مۆسیقای ژێداری کۆنە لە عوود دەچێت.

**rotgut** (rot′gut′), *n.* [Slang], گەندە ویسکی؛ خواردنەوەی خراپ.

**rotifer** (rō′ti-fẽr), *n.* گیانداریکی پێچکەیی ئاوی گەردبینی‌یە.
**-rotiferal; rotiferous** *(adj.)*.

**rotiform** (rō′tə-fôrm′), *adj.* چەرخی؛ پێچکەیی.

**rotisserie** (rō-tis′ẽr-i), *n.* (١) چێشتخانەی گۆشتی برژاو.
(٢) گۆشت برژێنی خولاوە

**rotl** (rot′'l), *n.* ڕەتڵ: کێشانەیەکە بریتی‌یە لە پاوەندێك.

**rotogravure** (rō′tə-grə-vyoor′, rō′tə-grā′vyoor), *n.* (١) لەچاپدانی ڕۆتوگرافی، واتا بە خولانەوە.
(٢) وێنە یا شتی لەچاپدراو بەم شێوەیە.

**rotor** (rō′tẽr), *n.* (١) ڕۆتەر. بەشی خولاوەی مەکینە؛ ئەو بەشەی مەکینە کە دەسووڕێتەوە. (٢) پەروانە؛ پەڕەی پەروانەی هێلیکۆپتەر.

**rotor ship,** جۆرە کەشتی‌یەکی بایەوانە.

**rototill** (rō′tə-til′), *v.t.* زەوی‌و چیمەن‌و باخچە کێلان بە مەکینەی خولاوە.

**rototiller** (rō′tə-til′ẽr), *n.* زەوی کێلی خولاوە (چیمەن‌و باخچەی پێ هەڵدەگێڕێنرێتەوە).

**rotten** (rot′'n), *adj.* (١) گەنیو؛ داوەشاو؛ پیس (هێلکە، خواردەمەنی)؛ کرمێ؛ کرمۆڵ. (٢) بۆگەن؛ بۆن کردوو. (٣) ڕزیو؛ خوراوەتەوە.
(٤) پیس‌و بۆگەن (مرۆڤ، ڕەووشت، کردار، ڕژێم...هتد)؛ بەد؛ ناپاك:
*( a ~ government, system, etc.)*
(٥) خراپ؛ زۆر خراپ؛ ناخۆش: *( a ~ day, trip, time, etc.)* .

**rotten borough,** (١) ناوچەیەکی ئینگلیزی‌یە کە هەرچی چەند ژمارەی دانیشتووەکانی زۆر کەم بوون نوێنەری پەرلەمانی خۆی هەبوو (لەپێش ساڵی ١٨٣٢). (٢) ناوچەیەکە کە زیاتر لە بەشی خۆی نوێنەری هەبێت لە پەرلەماندا.

**rottenstone** (rot′'n-stōn′), *n.* بەردێکی کلسی داڕزاوە بۆ ساف کردن بەکاردێت.

**rotter** (rot′ẽr), *n.* [ Chiefly British Slang ], کەسێکی پیس‌و بۆگەن‌و بێ فەڕ.

**rotund** (rō-tund′), *adj.* (١) خڕ.
(٢) خڕین؛ خڕومڕ؛ خڕوپڕ؛ گۆشتن؛ خڕکەلە: *( a ~ little man)*
(٣) پڕو بەهێز (دەنگ)؛ دەنگدەرەوە؛ بڵند (دەنگ): *( ~ speech)* .

**rotunda** (rō-tun′də), *n.* (١) خانووی خڕوگومەزدار؛ هۆڵێك یا ژوورێکی خڕی گەورەیە کە گومەزێکی بەسەرەوە بێت.
(٢) هۆڵ یا ژووری گەورەی بنمیچ بەرز.

**rotundity** (rō-tun′də-ti), *n.* (١) خڕی؛ خڕێتی.
(٢) قەڵەوی؛ خڕومڕی؛ خڕینەیی. (٣) شتێکی خڕو دەرپۆقیو.

**roturier** (rô′tü′ryā′), *n.* بۆرەپیاو.

**rouble** (rōō′b'l), *n.* = **ruble.**

**roue** (rōō-ā′), *n.* پیاوێکی سەرسەری‌و حەشەری؛ داوێن پیس.

**rouge** (rōōzh), *n.* (١) سووراو ( ئارایشت).
(٢) تۆزێکی سوورە خشڵ‌و شووشەو کانزای بێ ساف‌و لووس‌و بریقەدار دەکرێت.
*v.t.* سووراو لێدان؛ سووراوکردن؛ سوورکردن.
*v.i.* سووراوکردن؛ سووراو بەکارهێنان.

**rouge et noir,** [ Fr.], سوورو ڕەش: جۆرێکە لە قوماری کاغەز.

**rough** (ruf), *adj.* (١) زبر: *( a ~ surface)* .
(٢) سەخت (ڕێگە)؛ قۆرتاوی؛ ناڕێك؛ ناخۆش: *( a ~ road)* .
(٣) تیسکن؛ کولکن؛ تووکن: *( an animal with a ~ coat)* .
(٤) (ا) سەخت (ئاووهەوا)؛ ناخۆش: *( ~ weather)* .
(ب) هەڵچوو (دەریا)؛ شەپۆلدار؛ زریاناوی؛ شەپۆلاوی: *( ~ sea)* .
(ج) شەڕەشەقاوی؛ بە زەبرەزەنگ: *( ~ play)* .
(٥) بێ نەزاکەت؛ دڕ؛ توندوتیژ؛ تەنگەتیلکە:
*( ~ manners ; a ~ temper)*
(٦) ناساز: *( ~ sounds)* .
(٧) تیژ: *( ~ wine)* .
(٨) نەزان؛ ڕەشۆکی؛ کاڵ‌وکرچ (مرۆڤ، ڕەفتاری کۆمەڵایەتی)؛ کەرتڕ:
*( ~ men)*
(٩) سەخت (ژیان)؛ ناخۆش؛ ناهەموار؛ بەبێ پێویستی‌یەکانی ژیان:
*( a ~ life)*
(١٠) خاو (کانزا، خشڵ)؛ چاك نەکراو: *( ~ jewels)* .
(١١) ڕەشەك؛ گەلاڵە؛ ناپوخت؛ گەلاڵەنووس:
*( a ~ draft, copy, sketch, etc.)*
(١٢) نزیکەیی؛ گۆترە: *( a ~ estimate)* .
(١٣) قورس؛ گران: *( ~ work)* .
(١٤) [Colloq.]، ناخۆش؛ دژوار: *( a ~ day, time, etc.)* .

n. (١) زەوی نارێکوپێک؛ زەمینی قوڕتاوی. (٢) باری ناخۆش یا ناهەموار.
(٣) [Chiefly British]، کەسێکی سێبەندی، زرتەبۆز، یا بێ ئەزاکەت.
(٤) ئەو بەشەی یاریگای گۆلف کە چیمەنەکەی نەبڕرابێت.
adv. بە توندوتیژی؛ توندوتیژانە.
v.t. (١) زبرکردن
(٢) ( ~ up ) ، بە توندوتیژی لەگەڵ جووڵانەوە (بەتایبەتی لەکاتی یاریدا)؛ لێدان؛ هەڵگلۆفتنەوە. (٣) گەلاڵەکردن.
v.i. (١) زبربوون.
(٢) ڕەفتاری دڕو زرتەبۆزانە نواندن؛ بە توندوتیژی ڕەفتارکردن.
**in the rough,** بە خاوی (کانزا)؛ بە ناپوختی
**rough it,** هەڵ کردن بەبێ گەلێك پێویستی ژیان:
*( to rough it on a camping trip)*
**roughage** (ruf'ij), *n.* خواردەمەنی زبر: وەك سەوزەو توێکڵی میوەو دانەوێڵە (کە بۆ هەرس کردن باشن).
**rough-and-ready** (ruf'n-red'i), *adj.* (١) زۆر باش نییە، بەڵام کاری پێ ڕایی دەکرێت: *( ~ methods)* .
(٢) ڕەشۆکی و کەرترە بەڵام کار جێبەجێ دەکات: *( ~ fellow)* .
**rough-and-tumble** (ruf'n-tum'b'l), *adj.* بێ سەروبن؛ نارێکوپێک؛ بەرەڵاو توندوتیژ؛ زرتەبۆزانە: *( a ~ fight, scuffle, etc.)* .
n. پێکاهەڵپرژان؛ شەڕە مستەکۆڵە؛ بەیەکدادان؛ زرمەوکوت؛ شەڕەشەق.
**rough copy,** گەلاڵەنووس؛ ڕەشەك؛ گەلاڵە.
**rough draft,** ڕەشەك؛ گەلاڵەنووس؛ گەلاڵە.
**rough-dry** (ruf'drī'), *v.t.* جل شۆردن و ووشك کردنەوە بەبێ ئوتولێدان
*adj.* جلی شۆراو و ووشك کراوەی ئوتو لێ نەدراو.
**roughen** (ruf'n), *v.t. & v.i.* زبرکردن؛ زبربوون
**roughcast,** (١) گەچ یا قوڕو قسڵی زبرە بۆ سواغدانی دیواری دەرەوە.
(٢) گەلاڵە؛ گەلاڵەنووس؛ ڕەشەك.
*v.t.* (١) سواغدانی دیواری دەرەوە بە گەچ یا قوڕو قسڵی زبرو ناپوختە.
(٢) گەلاڵەکردن؛ گەلاڵەنووس کردن.
**rough-hew** (ruf'hū'), *v.t.* (١) گەلاڵەکردن (بەرد، دار).
(٢) گەلاڵەنووس کردن؛ گەلاڵەکردن.
**rough-house** (ruf'hous'), *n.* [Slang], زرمەزڵ؛ شەڕەشەق (بەتایبەتی هی ناومال)
*v.t. & v.i.* [Slang], زرمەزڵ کردن؛ شەڕەشەق کردن.
**roughish** (ruf'ish), *adj.* (١) نەختێك زبر
(٢) نەختێك توندوتیژ (ڕەفتار)
**roughly** (ruf'li), *adv.* (١) بە توندوتیژی؛ بە ناشرینانە. (٢) نزیکەی.
**roughneck** (ruf'nek'), *n.* [Slang], کەسێکی دڕ؛ پیاوێکی شەڕەنگێزو کەرتی.
**roughrider** (ruf'rīd'ēr), *n.* (١) سوارێکە کە جوانووە ئەسپ و ماین دەگرێ؛ جوانوو هێنەرەبەر بار. (٢) سوارێکی لێهاتوو؛ سوارێکە کە سواری ئەسپی چەمووش یا سەرکێش دەبێت.
**roughshod** (ruf'shod'), *adj.* ناڵەکانی چوقولی پێوەیە بۆ ئەوەی نەخلیسکێ: *( a ~ horse)* .
**ride roughshod over,** بە توندوتیژی لەگەڵدا جووڵانەوە.
**rouleau** (rōō-lō'), *n.* (١) بابۆڵەی پارەی ووردە (لە کاغەزێکی نەختێك نەستوورەوە دەپێچرێتەوە). (٢) شریتی لە کلاو یا شەپقەوە پێچراو.
**roulette** (rōō-let'), *n.* (١) رۆلێت؛ جۆرێکە لە قومار
(٢) چەرخێکی بچووکی ددانداره دەخولێنرێتەوە بەسەر ڕوویەکدا بۆ کون تێکردنی بە ڕیز (وەك پەڕەی پوولی پۆستە) یا نیشانە لەسەر هەڵکەندنی (وەك پەڕەی کانزا). (٣) ڕیزە کونی پەڕەی پوولی پۆستە.
**round** (round), *adj.* (١) (ا) خڕ (ب) بازنەیی؛ ئەڵقەیی؛ چەمەری
(٢) لوولەیی (٣) کەوانەیی.
(٤) خڕوپڕ؛ خڕکەلە؛ خڕو پڕ: *( a ~ little person)*
(٥) بازنەیی؛ ئەڵقەیی: *( a ~ dance)* .
(٦) (ا) تەواو؛ بێ کەمو زیاد: *( a ~ dozen)* .
(ب) تەواوکراو؛ تەواوبوو.
(٧) دووسەرە (گەشت)؛ چوون و هاتنەوە؛ ئەمسەرو ئەوسەر: *( a ~ trip)*
(٨) تەواو (ژمارە)؛ بێ کەرت؛ خشت.
(٩) خڕ (ژمارە)؛ ژمارەی وەك دەیی و سەدی و هەزاری:
*( 500 is a ~ number for 498 and 503.)*
(١٠) نزیکەیی؛ نزیکە لە ڕاستییەوە: *( a ~ guess)* .
(١١) زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ بێ شومار: *( a ~ sum)* .
(١٢) ڕێکوپێک: *( a ~ style of writing)* .
(١٣) دەنگێکی سازو دەنگدەرەوەو بڵند.
(١٤) خێرا؛ گورج وگۆل: *( a ~ pace)* .
(١٥) قسە لەڕوو؛ قسە نەشارەوە.
(١٦) بەبێ دوودڵی؛ بەبێ ڕاڕایی: *( a ~ oath)* .
n. (١) شتێکی خڕ، بازنەیی، ئەڵقەیی، یا لوولەیی.
(٢) پلە پەیژە؛ داری نێوان دوو قاچی کورسی.
(٣) سمتی گاو مانگا؛ گۆشتی ڕان. (٤) خڕی؛ ئەڵقەیی.
(٥) کۆمەڵە خەڵك؛ کۆڕ. (٦) سووڕ؛ خول؛ چەرخە.
(٧) سەمای ئەڵقەیی.
(٨) زنجیرە؛ چەند شتێك یا ڕووداننێکی یەك لەدوای یەك:
*( a ~ of dinner parties)*
(٩) مەودا؛ لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕ؛ هەموو: *( the ~ of human beliefs)*
(١٠) (ا) (*pl.*) ، چەرخە؛ چەرخەکردن؛ پێداگەڕان و هاتنەوە؛ گەڕانی پاسەوان بە ناوچەکەی خۆیدا:
*( The watchman made his ~s.)*
(ب) (*pl.*)، گەڕانی پزیشك بەسەر نەخۆشەکانیدا:
*( The doctor will make his ~s soon.)*
(١١) خواردنەوە گێڕان بەسەر هەموو ئەوانەی لە شوێنێکدان؛ خواردنەوەیەکی بەم جۆرە دراو بە تاقمێك خەڵك.
(١٢) تەقەیەك (تفەنگ، دەمانچە، تۆپ). (١٣) گوللە.
(١٤) چەپڵە ڕێزان: *( a ~ of applause)* .
(١٥) [British]، قاش؛ پارچە نان.
(١٦) چەند تیرێکی هاوێژراو لە دوورییەکی تایبەتییەوە.
(١٧) کایە (بۆکسبازی)؛ جار (قومار، یاری)؛ کەرەت؛ نۆرە.
(١٨) گۆرانییەکی کورتە لەلایەن چەند کەسێکەوە دەووترێت و دەووترێتەوە.
*v.t.* (١) خڕکردن؛ خڕ هەڵدان.
(٢) بە لێوخڕی ووتن (وەك تیپی " O " ).
(٣) قەڵەوکردن؛ خڕوپڕکردن. (٤) تەواوکردن؛ خشت کردن.
(٥) پێداگەڕان یا سووڕانەوە؛ چەرخە پێداکردن: *( We ~ed the island.)*
(٦) پێچکردنەوە؛ وەرچەرخان: *( He ~ed the corner.)* .
(٧) دەورەدان؛ ئابڵووقەدان.
(٨) چەرخاندن؛ چەرخەپێکردن؛ خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە.
*v.i.* (١) خولانەوە؛ سووڕانەوە؛ چەرخەکردن.
(٢) پێچ پیادان؛ وەرچەرخان؛ پێچکردنەوەو دەربازبوون:
*( The fleeing cat suddenly ~ed.)*
(٣) خڕبوون؛ خڕ هەڵدران.
(٤) خڕوپڕبوون؛ قەڵەوبوون؛ خڕینەبوون.
(٥) ( ~ **into** )، بوون بە: *( The talk ~ed into a plan.)* .
*adv.* (١) بە خڕی؛ بە ئەڵقەیی؛ بە بازنەیی.
(٢) دیسانەوە گەڕانەوە؛ دووبارە هاتنەوە:
*( The autumn came ~ once more.)*
(٣) بە چواردەوریدا؛ بەدەوریدا؛ بە دەوروپشتیدا.
(٤) بە کەمەرەکەیدا؛ چێوەکەی.
(٥) بە هەموولایەکدا: *( The meadows extended ~.)* .
(٦) نزیك؛ هی ئەو نزیکە یا دەوروپشتە:

*( He visited all the people ~ .)*

(٧) له هەمووشوێنێك؛ لێرەو لەوێ: *( The child played ~ .)* .

(٨) بەدەوری خۆیدا: *( The wheel spun ~ .)* .

(٩) پێچ' وەرچەرخان؛ به پێچەوانه: *( He turned ~ .)* .

*prep.* (١) بەدەوریدا: *( The rope was tied ~ the tree.)* .

(٢) به قەراغەکەیدا.

(٣) بەچواردەوریدا؛ به دەوروپشتیدا؛ به هەمولایەکدا.

(٤) نزیك؛ دەوروپشت: *( farms ~ the city)* .

(٥) به هەمولایەکیدا؛ پیایدا: *( He went ~ the museum.)* .

(٦) هەمیشه' شەوو ڕۆژ: *( He worked ~ the clock.)* .

(٧) له هەمووشوێنێك؛ لێرەو لەوێ: *( The child played ~ the room.)* .

(٨) بەدەوریدا (خولانەوه): *( The wheel goes ~ an axle.)* .

**go (or make) the rounds,** (١) بڵاوبوونەوه بەناو خەڵكدا (قاو، دەنگوباس). (٢) چەرخەکردن (پاسەوان)؛ سەرلێدان؛ پێداگەڕان (بۆ چاودێری):
[ *The watchman ( or the doctor) made his rounds.*]

**in the round,** شانۆکەی له ناوەڕاستی شانۆخانەکەدایەو خەڵك بەدەوریدا دادەنیشن: *( theatre in the round)* .

**round about,** (١) به چواردەوریدا؛ به دەوروپشتیدا.

(٢) به پێچەوانەوه؛ به وەرچەرخاوی.

(٣) نزیکەی: *( It will cost round about ten dollars.)* .

**round off ( or out ),** (١) خشت کردن (ژماره)؛ کەرت لێ لابردن به بەرزکردنەوه بۆ ژمارەی ئاینده:
*( to round off the expenses to the nearest dollar)*

(٢) دوایی پێ هێنان؛ تەواوکردن:
*( to round off a paragraph well)*

**round up,** (١) خڕکردنەوه (ڕەشەوڵاخ، ئاژەڵ)؛ ڕاپێچان؛ کۆکردنەوه.

(٢) [Colloq.]، ڕاپێچ کردن؛ ڕاپێچان؛ دەورەدان و گرتن؛ گرتن:
*( The demonstrators were rounded up.)*

**round** (round), *v.t. & v.i.* [Obs.], چرپاندن به گوێدا.

**roundabout** (round′ə-bout′), *adj.* ناڕاستەوخۆ؛ به پێچاوپێچ؛ پێچاوپێچاوی و دووروودرێژ: *( ~ methods ; a ~ trip)* .

*n.* (١) ڕێگەی پێچاوپێچ؛ ووتاری ناڕاستەوخۆو دووروودرێژ.

(٢) چاکەتێکی کورتی تەسکی پیاوانەو کوڕانەیه.

(٣) [Chiefly British]، **merry-go-round** .

**round dance,** (١) سەمای ئەڵقەیی (وەك هەڵپەڕکێی کوردی)؛ هەڵپەڕکێ. (٢) جۆره سەمایەکی دووکەسیيه ژن و پیاوێك دەیکەن بەدەوری ژوورێکی گەورەدا.

**rounded** (roun′did), *adj.* (١) خڕ' خڕ هەڵدراو؛ خڕکراو.

(٢) به خڕکردنی هەردوو لێو دەبێژرێ ( وەك " O ").

(٣) خشت (ژماره)؛ خشت کراو؛ نزیکەیی. (٤) تەواو؛ هاوتا.

**roundel** (roun′d'l), *n.* (١) شتێکی خڕ یا بازنەیی.

(٢) شتێکی کەوانەیی خانوو پێ ڕازێنەرەوه (شووشەی پەنجەره، تاق، قوژبن، تەبەق . هتد). (٣) پەنجەرەیەکی خڕی بچکۆله. (٤) **rondeau** .

(٥) سەمای ئەڵقەیی؛ هەڵپەڕکێ.

**roundelay** (roun′də-lā′), *n.* (١) گۆرانی یا بەستەیەکه که پارچەیەکی هەر دەووترێ و دەووترێتەوه. (٢) مۆسیقای ئەم گۆرانیيه.

(٣) سەمای ئەڵقەیی؛ هەڵپەڕکێ.

**rounder** (roun′dẽr), *n.* (١) پاسەوانی چەرخەکەر.

(٢) ئامێری خشت کردنی قوژبن و قەراغ دارو دیوار (خانووسازی)؛ ڕەنه.

(٣) (*pl.*) ، یارییەکی ئینگلیزییه له " بێسبۆڵ " دەچێت.

(٤) [R-]؛ [British]، قەشەی گەڕۆك یا چەرخەکار.

(٥) [Colloq.]، سەرسەرییەکی سەرخۆش و پاره لەبەرد دەر؛ تاوانکار.

**Roundhead** (round′hed′), *n.* سەرخڕ' ئەندامێکی حیزبی دژ به ڕژێمی پاشایەتی له ئینگلتەره لەکاتی شەڕی براکوژی ئینگلیزیدا له ساڵی ١٦٤٢-١٦٥٢

**roundhouse** (round′hous′), *n.* (١) خڕه خانوو (فارگۆنی شەمەندەفەری تێدا مۆڵ دەدرێ و چاك دەکرێ و جێگۆڕکێ پێ دەکرێ).

(٢) ژوورێکه له پشتەوەی بەشی حەوانەوەی کەشتییەوانەکان.

(٣) [Slang]، مستەکۆڵەیەکی لابەلایی.

**roundish** (roun′dish), *adj.* نەختێك خڕ.

**roundlet** (round′lit), *n.* بازنەی بچووك؛ شتێکی خڕی بچووك.

**roundly** (round′li), *adv.* (١) به خڕی.

(٢) (ا) به توندوتیژی؛ به توندی: *( He was ~ rebuked.)*

(ب) به تەواوی.

**round robin,** (١) سکاڵانامەیەکی مۆرکراوه به شێوەیەکی بازنەیی بۆ ئەوەی نەزانرێ کێ له پێشەوه مۆری کردووه. (٢) بۆڕبۆڕێنێکه هەریەکه لەوانەی بەشداری تێدا دەکەن لەگەڵ هەموو ئەوانەی تردا بۆڕبۆڕێن دەکەن.
(٣) نامەیەکی بڵاوکراوەیه بەسەر چەند کەسێکدا که هەرکەسه تێبینی خۆی لەسەر دەنووسێت پاش خوێندنەوەی. (٤) ڕیز؛ ڕیزی درێژ؛ زنجیره.

**roundsman** (roundz′mən), *n.* (١) چاودێری پاسەوان؛ سەرکاری پاسەوان. (٢) دابەشکەری فرۆتەنی بەسەر ئەو فرۆشگا تاکفرۆش و ماڵانەدا که داوای ئەو فرۆتەنیيانەیان کردووه.

**round steak,** توێ گۆشتی ڕانی گا.

**round-table** (round′tā′b'l), *adj.* بەدەوری مێزێکی خڕدا (کۆڕ):
*( a ~ discussion)*

**Round Table,** (١) خڕ مێزی پاشای ئەفسانەیی ئینگلیزی " ئارسەر".

(٢) پاشا " ئارسەر" و سوارچاکەکانی.

(٣) [r- t-]، کۆڕێکی چەند کەسی.

**round-trip** (round′trip′), *adj.* دووسەره (گەشت):
*( a ~ ticket)*

**round trip,** گەشتی دووسەره؛ چوون و هاتنەوه.
(پێشی دەووترێ: " **return trip** ").

**round-up** (round′up′), *n.* (١) خڕکردنەوه یا ڕاپێچانی گاگەل.

(٢) گاگەلی خڕکراوه یا ڕاپێچ کراو.

(٣) گاوان یا کاوبۆی ئەسپ سواری گاگەل ڕاپێچکەر.

(٤) ڕاپێچ کردن؛ ڕاپێچان: *( a ~ of suspected persons)*

**round-worm** (round′wũrm′), *n.* کرمی لوولەیی (له ڕیخۆڵەی مرۆڤ و گیانداری تردا دەژی).

**roup** (ro͞op), *n.* (١) وەناقی مریشك (نیشانەکانی ئاو له چاوو لووت هاتن و دەنگ نووسانه) (٢) دەنگ گڕی؛ دەنگ نووساوی؛ دەنگ نووسان.

**rouse** (rouz), *v.t.* (١) هەڵساندن (باڵندەو نێچیری تر له هێلانەو کونەکانیان بۆ ڕاوکردنیان). (٢) وورووژاندن؛ تووڕەکردن؛ جم‌وجووڵ تێخستن؛ بزووتنەوه. (٣) ڕاپەڕاندن؛ له خەو هەڵساندن. (٤) ڕاکێشان (کەشتیوانی).

*v.i.* (١) هەڵسان (له هێلانەو کون)؛ هەڵفڕین. (٢) لەخەوهەڵسان؛ ڕاپەڕین

(٣) بزووتنەوه؛ جم‌وجووڵ تێکەوتن؛ ڕاپەڕین؛ خرووشان.

*n.* (١) هەڵسان؛ لەخەوهەڵسان؛ ڕاپەڕین.

(٢) کەڕەنا یا تەپڵی سەرباز لەخەوهەڵسان.

**rousing** (rouz′iŋ), *adj.* (١) گەرم؛ بەجۆش؛ هەست جووڵێن:
*( a ~ speech, welcome, etc.)*

(٢) گەرم (بازاڕ): *( a ~ business)* .

(٣) [Colloq.]، سەرئاسا، سەرسوڕمێنەر؛ گەوره (درۆ).

**roust** (roust), *v.t.* ڕاپەڕاندن؛ دەرپەڕاندن (لەجێی نووستن).

**roustabout** (roust′ə-bout′), *n.* (١) کرێکاری لەنگەرگای کەشتی و بەلەم له بەندەردا؛ کرێکاری سەر کەشتی. (٢) کرێکاری سێرك.

(٣) کرێکاری نەوکار یا نەشارەزا (له بیره نەوت یا ئاژەڵگادا).

**rout** (rout), *n.* (١) ڕووتەوپووته؛ جەماوەر؛ خەڵکی ڕەش‌وڕووت.

(٢) ئاشووب؛ ئاژاوه. (٣) ڕافڕان (لەشکری شکاو)؛ ڕاکردن؛ ڕاونران؛ بەپەله کشانەوه له مەیانی جەنگ بەهۆی بەزینەوه.

(٤) بەزینێکی تەواو (لەشکر)؛ لەشکر شکان؛ دۆڕانی تەواو.

(٥) [Archaic or Poetic]، (ا) دەسته؛ تاقم. (ب) دەست‌وپێوەند.

(٦) [Archaic]، ئاهەنگ (بەتایبەتی هی خەڵکی ناسراوی کۆمەڵ لە ئێوارەدا).
*v.t.* (١) ڕافراندن (لەشکر)؛ ڕاونان؛ قاودان؛ دەرپەڕاندن.
(٢) بەزاندن بە تەواوی؛ شکاندن (لەشکر).
**rout** (rout), *v.i.* (١) بە لمۆز خاك و خۆڵ هەڵگێڕانەوە و بۆ خواردن گەڕان (بەراز). (٢) پشکنین؛ پێداگەڕان
*v.t.* (١) هەڵگەڕاندنەوەی خاك و خۆڵ بە لمۆز بۆ خواردن (بەراز).
(٢) ( ~ out ) ، پشکنین و دۆزینەوە؛ دەرخستن؛ هەڵماڵین.
(٣) ناودەرهێنان؛ بۆش کردن؛ لێ دەرهێنان؛ دەرهێنان.
(٤) دەرپەڕاندن (لە جێ، ماڵ، کون، جێی خۆشاردنەوە)؛ دەرکردن.
**route** (rōōt), *n.* (١) (ا) ڕێگە؛ ڕێ؛ ڕێباز؛ ڕێڕەو.
(ب) ڕێگاوبانی دەرەوەی شار؛ شاڕێ. (٢) ڕێگەیەکی ڕێك و پێکی بە ئاسایی هاتوچۆ پێداکراو؛ هێڵی هاتووچۆ (شەمەندەفەر، فڕۆکە، پاس).
(٣) (ا) دابەشکردنی فرۆتەنی لەلایەن کرێکارێکەوە بەسەر ئەو ماڵ و فرۆشگایانەدا کە داوایان کردووە (ڕۆژنامە، شیر... هتد).
(ب) ڕێگەی ئەم دابەشکردنە. (ج) کڕیارەکانی ئەم دابەشکردنە.
(٤) فەرمانی گواستنەوەی لەشکر و ڕێگەوبانی ئەم گواستنەوەیە.
*v.t.* ناردن بە ڕێگەیەکی تایبەتیدا؛ لە ڕێیەکی تایبەتییەوە ڕەوانەکردن:
*( The travel agency ~d them to Paris by way of New York.)*
**router** (rout'ẽr), *n.* ڕەنە (دارتاشی)؛ ئامێری خشت کردن و ساف و لووس کردن.
**routine** (rōō-tēn'), *n.* (١) ڕۆتین؛ جێبەجێکردنی کار لەسەر یەك شێواز و بەبێ هیچ گۆڕینێك. (٢) خۆنواندنێکی یەك شێوازی سەر شانۆیەکە هەر پیشان دەدرێ و دەدرێتەوە.
*adj.* ڕۆتینی؛ لەسەر یەك شێواز و بەبێ گۆڕین.
-routinely *(adv.)*; routinism *(n.)*; routinist *(n.)*.
**routinize** (rōō-tēn'īz'), *v.t.* کردن بە ڕۆتین؛ لەسەر یەك شێواز کردن و کردنەوە.
**roux** (rōō), *n.* ڕوو بریتییە لە ئاردی سوورەوەکراو لە ڕۆنی هەڵقرچاودا.
**rove** (rōv), *v.i.* گەڕان بە هەموولایەکدا؛ سووڕانەوە.
*v.t.* پیاگەڕان؛ پیا سووڕانەوە: *( He ~d the woods.)* .
*n.* گەڕان بە هەموولایەکدا؛ سووڕانەوە.
**rove** (rōv), *v.t.* (١) شیکردنەوە پێش ڕستن (خوری، لۆکە).
(٢) کردن بە کوندا (ڕیشاڵی خوری و لۆکە).
*n.* ڕیشاڵی لوول و درێژی لۆکە و کەتان.
**rove** (rōv), *alternative past tense and p.p. of* **reeve**.
**rove beetle,** قالۆنچە گەڕۆك: قالۆنچەیەکی درێژکۆلەی گەندەخۆری خێرایە
**rover** (rōv'ẽr), *n.* (١) گەڕۆك؛ مرۆڤی گەڕۆك.
(٢) (ا) نیشانی بە ڕێکەوت هەڵبژێراو (تیر هاویشتن) (ب) تیرهاوێژی دوور.
**rover** (rōv'ẽr), *n.* (١) چەتەی دەریا. (٢) کەشتی چەتەی دەریا.
**row** (rō), *n.* (١) ڕیز *( a ~ of house, trees, etc.)* .
(٢) ڕیزە کورسی (سینەما، قوتابخانە، شانۆ).
(٣) شەقامێکە کە هەردوو بەری ڕیزە خانوو بێت.
*v.t.* ( ~ up), ڕیزکردن.
**hard ( or long ) row to hoe,** ئیشی گران؛ کاری سەخت.
**row** (rō), *v.t.* (١) سەوڵ لێدان. (٢) گواستنەوە بە بەلەمی سەوڵ.
(٣) بەکارهێنانی کەسێك بۆ سەوڵ لێدان.
(٤) بەشداری کردنی بۆڕبۆڕێنی سەوڵ لێدان.
*v.i.* (١) سەوڵ لێدان. (٢) بە سەوڵ ڕاندن یا لێخوڕین.
*n.* (١) سەوڵ لێدان. (٢) (ا) گەشتی سەوڵ لێدان. (ب) دووری ئەم گەشتە.
**row** (rou), *n.* (١) دەمەقاڵێ؛ شەڕ.
(٢) دەنگەدەنگ؛ هەراوزەنا؛ هەراهەرا.
*v.i.* [Colloq.], شەڕکردن؛ بەشداربوون لە دەمەقاڵێ یا هەراوزەنادا.
*v.t.* [Colloq.], سەرزەنشتی کردن؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن.
**rowan** (rō'ən, rou'ən), *n.* درەختێکی گوڵ سپی و بەر سوورە. (پێشی دەوترێ: " **rowanberry** ").
**rowboat** (rō'bōt'), *n.* بەلەمی سەوڵ.
**rowdy** (rou'di), *n.* کەسێکی دڕ، چەتوون، شەلاتی... هتد.
*adj.* چەتوون؛ دڕ: *( a ~ person, audience, etc.)* .
-rowdily *(adv.)*; rowdiness *(n.)*; rowdyism *(n.)*.
**rowdyish** (rou'di-ish), *adj.* ئەختێك دڕو شەڕانی و چەتوون.
**rowel** (rou'əl), *n.* چوقولی ئاوزەنگی.
*v.t.* ئاوزەنگی لێدان؛ تێوەژەندن.
**rowen** (rou'ən), *n.* گزرە گیای دووهەمی هەمان وەرز (کە سەرهەڵدەداتەوە پاش یەکەم دوورینەوەی).
**rower** (rō'ẽr), *n.* سەوڵ لێدەر.
**rowlock** (rō'lok', rul'ək), *n.* [Chiefly British], = **oarlock.**
**royal** (roi'əl), *adj.* (١) پاشایی؛ تایبەتی بە پاشا:
*( the ~ family; a ~ edict)*
(٢) شانشینی؛ پاشایی: *( a ~ fleet)* .
(٣) شایانە؛ زۆر نایاب؛ شایانی پاشایە؛ شاهانە: *( a ~ treatment)* .
(٤) بەشکۆ؛ شایانە: *( a ~ air, bearing, etc.)* .
(٥) زۆر گەورە؛ زۆر نایاب.
*n.* جۆرە کاغەزێکی گەورەیە بۆ چاپ.
**royal blue,** شینی تۆخی ئەختێك سوورکار.
**royalism** (roi'əl-iz'm), *n.* (١) پاشایەتی؛ ڕژێمی پاشایی.
(٢) شاخوازی؛ شاویستی؛ پاشاخوازی.
**royalist** (roi'əl-ist), *n.* شاخواز؛ شاویست؛ پاشاخواست:
(ا) [R-]، پاڵپشتیکەری چارلسی یەکەم، شای ئینگلتەرە.
(ب) پاڵپشتیکەری ئینگلیزەکان و ئینگلتەرە لە شۆڕشی ئەمەریکادا.
(ج) پاڵپشتیکەری بۆڕبۆنەکانی فەرەنسە.
**royal jelly,** هەنگوینی شایانە: خواردنی کرمۆکەی هەنگ و بانووشای پوورە هەنگە.
**royally** (roi'əl-i), *adv.* شایانە؛ بە جۆرێك کە بۆ شا بشێت:
*( We were treated ~ by everyone.)*
**royal palm,** دارخورمای شایانە؛ دارخورمایەکی درێژە بۆ ڕازاندنەوە.
**royal purple,** ئەرخەوانی شایانە: ئەرخەوانییەکی تۆخی شینکارە.
**royalty** (roi'əl-ti), *n.* (١) شایەتی؛ پلەوپایە و دەسەڵاتی شا.
(٢) شا؛ شازادە؛ شازادان. (٣) شانشین.
(٤) تایبەخۆی شایانە؛ شکۆ؛ بەرزی؛ مەزنی.
(٥) *(pl.)* ، مافی شا.
(٦) (ا) مافی پاشا بەسەر زەوی و زار یا سامانی ژێرزەمینی بەخشراو
(ب) باج یا مزی ئەم شتە بەخشراوانە.
(٧) (ا) مز؛ بەشی نووسەر لە داهاتی پەرتووکی فرۆشراو و هی دەرهێنەر و نوواندنەری فیلمی سینەما بۆ پیشاندانی فیلمەکەیان.
(ب) مز؛ بەشی داهێنەر لە داهاتی ئەو شتەی کە دای هێناوە.
**-rrhea; -rrhoea; -rhea; -rhoea** (rē'ə), پاشگرێکە بەمانای: لێ هاتن (شلە)؛ لێ هاتنەدەرەوە: *( gonorrhea; diarrhea)* .
**rub** (rub), *v.t.* (١) لێخشاندن؛ لێخستن؛ پیاهێنان؛ لێ سووان.
(٢) هەنوون؛ تێهەڵسوون؛ شێلان.
(٣) ( ~ together ) ، لەیەکخشاندن؛ لەیەکخستن.
(٤) هەڵکلۆفتن؛ هەڵوولین؛ کڕاندن؛ هەڵکڕاندن.
(٥) خوراندن. (٦) ڕووشاندن.
(٧) ( ~ out ; ~ off ; ~ away ) ، لێکردنەوە (پیسی، چڵك)؛ لێ لابردن؛ لێ فڕێدان؛ سڕینەوە.
*v.i.* (١) لێخستن؛ کڕان؛ هەڵکڕان؛ پیاهێنان.
(٢) ( ~ on ; ~ against )، بەرکەوتن؛ لێکەوتن؛ لێخشان:
*( The tire ~s against the fender.)*
(٣) ڕووشان؛ برینداربوون.
(٤) ( ~ off ; ~ out )، لێبوونەوە (پیسی، چڵك... هتد)؛ سڕانەوە.

(٥) بەردەوام بوون بەلاٌم بە گران؛ بە گران بۆ پێشەوە ڕۆیشتن.

*n.* (١) لێخستن؛ لێکخستن؛ لێخشان.
(٢) هەنوون؛ تێهەڵسوون؛ لێدان (بۆیە... هتد).
(٣) خوران. (٤) ڕووشاوی؛ شوێنی ڕووشاو یا بریندار.
(٥) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ؛ ناڕێکی؛ قۆرت.
(٦) گیروگرفت؛ گێچەڵ؛ کێشە؛ تەنگوچەڵەمە: *( Aye, there's the ~ .)* .
(٧) لاقرتێ؛ سەرزەنشتی؛ گاڵتەپێکردن.

**rub down,** (١) شێلان؛ هەنوون
(٢) ساف‌و لووس کردن (بە لێخستن)؛ ڕێك کردن.

**rub it in,** [Slang], برین کولاندنەوە (مەجان)؛ پەیتا پەیتا خستنەوە بیری کەم‌وکووڕی‌و هەڵەی کەسێك.

**rub off,** لێکردنەوە (بە لێخستن)؛ لێبوونەوە؛ سڕینەوە.

**rub out,** (١) سڕینەوە؛ لێکردنەوە (بە لێخستن)؛ لێبوونەوە؛ لێکرانەوە.
(٢) [Slang]. کوشتن.

**rub ( a person) the wrong way,** پەستکردن؛ تووڕەکردن؛ دەمارگرتن؛ دەماری خراپ گرتن.

**rubadub** (rub'ə-dub´), *n.* دەنگی تەپڵ

**rubasse** (rōō-bas', rōō-bäs'), *n.* ڕوباس: جۆرێکە لە بەردی " کوارتز" ڕەنگەکەی سوورێکی تۆخە.

**rubber** (rub'ēr), *n.* (١) (ا) لێخەر؛ لێدەر (بۆیە... هتد)؛ لێخشێنەر.
(ب) پشت شێل (بە پیشە)؛ لەش شێل.
(٢) ئامێری هەڵکڕاندن یا ساف‌و لووس کردن (بریەند، شتی زبر).
(٣) لاستیك؛ شیرە لاستیك. (٤) لاستیکی خەت کوژاندنەوە.
(٥) (*pl.*) ، کالۆش (پێڵاو). (٦) [Slang]، لاستیکی گان.
(٧) ئەو پارچە لاستیکە لاکێشەییەیە کە یاریکەری بێسبۆڵ لەسەری ڕادەوەستێ لەکاتی تۆپ هاویشتندا.

*adj.* لاستیکی؛ بکێش.

*v.i.* [Slang], مل درێژکردن یا ئاووڕدانەوە بۆ سەیرکردنی شتێك.

**rubber** (rub'ēr), *n.* (١) یاری یا بۆڕبۆڕێنێکی سێ لایەیی یا پێنج لایەیی‌یە ئەو کەسە یا تیپەی زۆربەی کایەکان بەرێتەوە یارییەکە دەباتەوە.
(٢) کایەی بردنەوە؛ کایەی برانەوە.

**rubber band,** پێبەستی لاستیك؛ لاستیکی پێ بەستن.

**rubber check,** [Slang], چەکی گەڕاوە بۆ خاوەنەکەی لەلایەن بانقەوە بەبێ گۆڕینەوەی (لەبەر نەبوونی پارە لە حسابی ئەو کەسەدا).

**rubberize** (rub'ēr-īz´), *v.t.* لاستیك تێگرتن؛ لاستیك تێخستن؛ شیرە لاستیك تێکردن.

**rubberneck** (rub'ēr-nek´), *n.* [Slang], گەشتیارێکی نەبلەقی زۆر حەز بە سووسەو پرسیار کەر.

*adj.* [Slang], هی گەشتیاران؛ هی گەشتیاری.

*v.i.* [Slang], مل درێژکردن یا ئاووڕدانەوە بۆ سەیرکردنی شتێك؛ نەبلەق بوون (گەشتیار).

**rubber plant,** (١) داری لاستیك.
(٢) ڕووەکێکی گەلا زۆر پان‌و گەورەو بریقەدارو لاستیکی‌و لاسك درێژی ڕازێنەرەوەیە

**rubber-stamp** (rub'ēr-stamp´), *v.t.* (١) مۆرکردن؛ مۆر لێدان.
(٢) [Colloq.]، مۆرکردن یا پەسەندکردن بە ڕۆتینی‌و بێ بیرکردنەوە.

**rubber stamp,** (١) مۆر.
(٢) کەسێك؛ ئەنجوومەنێك؛ یا پەرلەمانێکە کە شت مۆر دەکات یا پەسەند دەکات بە ڕۆتینی‌و بەبێ بیرکردنەوە: *( Their parliament is nothing but a ~ .)*
(٣) مۆرکردن یا پەسەندکردنی هەر بەناوو ڕۆتینی‌و بێ بیرکردنەوە.

**rubbery** (rub'ēr-i), *adj.* لاستیکی؛ بکێش؛ کشاو؛ جیڕ.

**rubbish** (rub'ish), *n.* (١) زبڵ؛ سەرکۆزەر؛ پاشماوە؛ پاشەڕۆك.
(٢) قسەی هیچ‌وپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ مانا.

**rubbishy** (rub'ish-i), *adj.* (١) پاشەڕۆکی؛ زبڵی؛ سەرکۆزەری.
(٢) پڕە لە پاشەڕۆك؛ زبڵاوی. (٣) بێ فەڕ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ.

**rubble** (rub''l), *n.* (١) ووردە بەرد؛ بەردی نەقاڕی نەکراو؛ بەردە شکاو.
(٢) دیواری ووردە بەردو بەردی نەقاڕی نەکراو؛ بەردکاری (بە بەردی شکاو).
(٣) خۆڵ‌و داروبەردی خانووی وێران کراو؛ داروپەردووی خانووی ڕووخاو؛ کەلاوە.

-**rubbly** *(adj.).*

**rubblework** (rub''l-wŭrk´), *n.* بەردکاری (بە بەردە شکاو)؛ دیواری بەردە شکاو‌و بەردی نەقاڕی نەکراو.

**rubdown** (rub'doun´), *n.* لەش شێلانی توند.

**rube** (rōōb), *n.* [Slang], لادێیی‌یەکی سادەو نەزان.

**rubefacient** (rōō´bə-fā'shənt), *adj.* پێست سوورکەرەوە.

*n.* شتێکی پێست سوورکەرەوە (وەك مشەمای لە پشت گیراو بۆ ئێش‌و ئازار).

**rubella** (rōō-bel'ə), *n.* دڕکە؛ سوورێژەی ئەڵمانی.

**rubellite** (rōō-bel'īt), *n.* تورمالینی سوور؛ بەردێکی بەنرخی سوور یا پەمەیی‌یە.

**rubeola** (rōō-bē'ə-lə), *n.* (١) measles . (٢) rubella .

**rubescent** (rōō-bes''nt), *adj.* ڕەنگ سوورهەڵگەڕاو (لە شەرمدا یا تەریق بوونەوەدا).

-**rubescence** *(n.).*

**Rubicon** (rōō'bi-kon´), *n.* (١) ڕوبیکۆن: ڕوبارێکە لە باکووری ئیتاڵیا. (٢) سنوور.

**cross ( or pass ) the Rubicon,** لە ڕوباری ڕۆبیکۆن پەڕینەوە؛ بڕیارێك دان کە هەڵوەشانەوەی نەبێت.

**rubicund** (rōō'bi-kund´), *adj.* سوور (دەم‌وچاو)؛ دەم‌وچاو گەش‌و سوور.

**rubicundity** (rōō´bi-kun'də-ti), *n.* سووری‌و گەشی (دەم‌وچاو).

**rubidium** (rōō-bid'i-əm), *n.* ڕوبیدیۆم: توخمێکی کیمیایی زیوی‌یە لە " پۆتاسیۆم " دەچێت.

**rubied** (rōō'bid), *adj.* یاقووتی؛ سووری تۆخ.

**rubiginous** (rōō-bij'ə-nəs), *adj.* ژەنگی؛ قاوەیی سوورکار.

**rubious** (rōō'bi-əs), *adj.* یاقووتی؛ سوور.

**ruble; rouble** (rōō'b'l), *n.* ڕۆبڵ: پارەی یەکێتی سۆڤیەتی جارانە.

**rubric** (rōō'brik), *n.* (١) سەرباس؛ سەردێڕ یا یەکەم تیپی بە سوور نووسراو یا چاپکراو؛ سەرووتار.
(٢) ئامۆژگاری بە سوور نووسراوی ناو نامیلکەی نوێژو نزای کڵێسە
(٣) سەرباسی بە سوور نووسراوی پاشا. (٤) شێواز؛ ڕێباز.

*adj.* (١) بە سوور نووسراو.
(٢) [Archaic]، سوور، سوورکار.

-**rubrical** *(adj.).*

**rubricate** (rōō'bri-kāt´), *v.t.* (١) بە سوور نیشانەکردن یا ڕازانەوەی پەڕتووك؛ بە تیپی سوور نووسین یا چاپ کردن. (٢) ئامۆژگاری پێدان یا بۆ ئامادەکردن دەربارەی نوێژو نزاو نەریتی ئاینی تر لە کڵێسەدا.

-**rubrication** *(n.)*; **rubricator** *(n.).*

**rubrician** (rōō-brish'ən), *n.* زانای ئامۆژگاری نوێژو نزاو نەریتی ئاینی لە کڵێسەدا.

**ruby** (rōō'bi), *n.* (١) گەوهەری شەوچرا؛ گەوهەری سوور؛ یاقووت.
(٢) شتی لە یاقووت دروستکراو. (٣) سووری تۆخ.
(٤) شتێکی یاقووتی یا سوور (شەراب).
(٥) [British]، جۆرە تیپێکی چاپەمەنی‌یە بە قەوارەیەکی تایبەتی.

*adj.* سووری تۆخ.

**ruck** (ruk), *n.* (١) کۆمەڵ؛ بارست.
(٢) کۆمەڵێکی هەمەچیزە یا هەمەڕەنگ. (٣) جەماوەری هەرەمە.
(٤) کۆمەڵە ئەسپی بەجێماو (غارغارێن).

**ruck** (ruk), *v.t.* (١) چرچ‌ولۆچ کردن؛ ژاکاندن.
(٢) ( ~ **up** ) ، شێواندن، تێکدان.

*v.i.* (١) چرچ‌ولۆچ بوون؛ ژاکان. (٢) شێوان؛ تێکچوون.
*n.* چرچ‌ولۆچ؛ ژاکاوی.
**rucksack** (ruk′sak′), *n.* توورەکەی شان.
**ruckus** (ruk′əs), *n.* [Dial. or Colloq.], گەرەلاوژە؛ پشێوی؛ هەراوزەنا؛ هەراوهوریا.
**ruction** (ruk′shən), *n.* ئاژاوە؛ شەڕو هەرا.
**rudd** (rud), *n.* ماسی‌یەکی ڕوباری‌یە.
**rudder** (rud′ẽr), *n.* (١) دەستاژووی کەشتی؛ سوکان یا دەسکی لێخوڕینی کەشتی.
(٢) بەشێکی کلکی فڕۆکەیە یارمەتی لێخوڕین یا فڕینی فڕۆکەکە دەدات.
(٣) ڕابەر؛ چاوساغ؛ ئاراستەکەر؛ هۆی ڕانومایی.
**ruddle** (rud′'l), *n. Also* **reddle, raddle,** بۆیەی سوور.
*v.t.* بۆیەی سوور لێدان؛ سوورکردن.
**ruddock** (rud′ək), *n.* سنگ زەردە؛ بورکەسوورە؛ باڵندەیەکی بچووکە ئەوەندەی چۆلەکەیەك دەبێت.
**ruddy** (rud′i), *adj.* (١) سوورو گەش (پێست، دەم‌وچاو): *( a ~ complexion)*
(٢) سوور؛ سوورکار
-**ruddily** *(adv.)*; **ruddiness** *(n.)*.
**ruddy duck,** مراوی‌یەکی ئەمەریکی‌یە.
**rude** (rōōd), *adj.* (١) کێوی؛ نەزان؛ کاڵ‌وکرچ (مەجاز)؛ ساکار؛ سەرەتایی: *( ~ men, methods, etc.)*
(٢) ناڕێك‌وپێك؛ ناپوخت؛ ناکارامە؛ خاو؛ باش نەکراو: *( ~ path, drawing, style, plan, etc.)*
(٣) بەهێز؛ بەتین؛ باش: *( ~ health)*.
(٤) بێ نەزاکەت؛ کەرتڕ؛ قسە سوێر؛ قسە ڕەق: *( a ~ remark, reply, person, etc.; ~ behavior)*
(٥) ناساز (دەنگ): لەگەڵ یەك نەگونجاو؛ ناکۆك: *( ~ tones)*.
(٦) توندوتیژ؛ داچڵەکێن؛ دڵ خورپێن؛ سەرسوڕمێن: *( a ~ awakening; a ~ shock)*
-**rudely** *(adv.)*; **rudness** *(n.)*.
**ruderal** (rōōd′ə-r'l), *adj.* لەناو زبڵ‌و زەوی بەرەڵادا ڕوواو.
*n.* ڕووەکێکە کە لە شوێنی وەهادا بڕوێت.
**rudesby** (rōōdz′bi′), *n.* [Archaic], کەسێکی بێ نەزاکەت‌و بێ ڕەووشت‌و ناکەس
**rudiment** (rōō′də-mənt), *n.* (١) بنچینەکان؛ سەرەتاکان: *( the ~s of art, science, etc.)*
(٢) (*pl.*)، سەرەتا؛ چەکەرە (مەجاز)؛ سەرەتای شتێك کە لەوانەیە پەرە بسێنێ: *( the ~s of social behavior in children)*.
(٣) ئەندامێکی پەرەنەسێنی بێ ئەرکی لەش (مەمکی پیاو)؛ ئەندامی گەورە نەبوو؛ جێ نیشانەی ئەندامێکی وەها
**rudimentary** (rōō′də-men′tẽr-i), *adj.* (١) سەرەتایی؛ بنچینەیی *( ~ knowledge; ~ rules of behavior)*.
(٢) ساوا؛ تازە پەیدابوو یا سەرهەڵداو
(٣) گەورە نەبوو یا پەرەنەسێن (ئەندامی لەش)؛ تەنها جێ نیشانەکەی دیارە؛ کوێر بووەتەوە *( a ~ organ)*.
-**rudimentarily** *(adv.)*; **rudimentariness** *(n.)*.
**rue** (rōō), *v.t.* پەشیمان بوونەوە؛ تۆبەکردن؛ داخ بۆ خواردن؛ پاشگەزبوونەوە.
*v.i.* پەشیمان بوونەوە؛ داخ بۆ خواردن.
*n.* [Archaic], (١) پەشیمانی؛ داخ؛ پاشگەزی.
(٢) بەزەیی؛ بەزەیی پیاهاتنەوە؛ دڵ پێ سووتان.
**rue** (rōō), *n.* ڕووەکێکی هەمیشە سەوزی بۆن خۆشی گەڵا تاڵی پزیشکی‌یە.
**rueful** (rōō′fəl), *adj.* (١) جێی داخ‌و خەفەتە.
(٢) دڵتەنگ؛ دڵگیر؛ خەفەتبار؛ مات‌ومەلوول.
-**ruefully** *(adv.)*; **ruefulness** *(n.)*.
**rufescent** (rōō-fes′'ns), *adj.* سوورکار.
**ruff** (ruf), *n.* (١) ملیوانی لۆچ لۆچاوی یا فشەڵ (پیاوو ژن لە سەدەی شانزەو حەڤدەدا لە ملیان دەکرد). (٢) پەڕو تووکی دەوری ملی باڵندەو گیانداری شیردەر (شێن). (٣) نێرینەی چۆلەکەی لم (لە وەرزی جووت بووندا پەڕی جوان لە ملی دێت وەك هی کەڵەشێرە مێیەکانی پێیان دەوترێ " **reeve** ". (٤) جۆرە کۆترێکی پەڕ لە ملە.
**ruff** (ruf), *n.* [Obs.], (١) جۆرە یاری‌یەکی کاغەزە.
(٢) فڕێدان یا یاری پێکردنی کاغەزی براوە.
*v.t. & v.i.* یاری پێکردنی کاغەزی براوە یا دەستی براوە.
**ruff; ruffe** (ruf), *n.* ماسی‌یەکی بچووکی ڕوباری‌یە.
**ruffed grouse,** مامرە کێوی‌یەکی مل پەڕاوی کلك باوەشێنی‌یە.
**ruffian** (ruf′i-ən, ruf′yən), *n.* کەسێکی دڕندەو یاخی؛ سێبەندی؛ شەلاتی.
*adj.* دڕندە؛ یاخی؛ سێبەندی.
-**ruffianism** *(n.)*; **ruffianly** *(adj.)*.
**ruffle** (ruf′'l), *v.t.* (١) شەپۆلی بچووك بچووك تێخستن؛ کەروێشکەپێکردن؛ ژاکاندن؛ شێواندن: *( The wind ~s the surface of the water.)*
(٢) ژاکاندن؛ چرچ‌ولۆچ کردن؛ فشکردنەوەی جل‌و بەرگ بە شێوەی شەپۆل بۆ جوانی. (٣) فشکردنەوە (پەڕی باڵندە).
(٤) پەستکردن؛ دڵ شکاندن؛ دڵ گرتن: *( Nothing ~s her.)*
(٥) (ا) پەڕەپەڕەکردن. (ب) تێکەڵکردن (دەستە کاغەزی یاری‌و قومار).
*v.i.* (١) ژاکان؛ چرچ‌ولۆچ بوون؛ فش بوونەوە.
(٢) پەست بوون؛ دڵ گیران؛ دڵ شکان.
*n.* (١) تیرە نەقشی قوماش؛ ژاکاوی یا لۆچی دەسەنقەست (جل‌وبەرگ، قوماش).
(٢) فش بوونەوەی پەڕی باڵندە. (٣) پەستی؛ دڵ گیران؛ دڵ شکان.
(٤) شەپۆل؛ شێوان (ڕووی شتێك).
**ruffle** (ruf′'l), *n.* تەپڵ لێدانێکی نزم‌و بەردەوام.
*v.t. & v.i.* تەپڵ لێدان بە دەنگی نزم‌و بەردەوام.
**ruffle** (ruf′'l), *v.i.* (١) کردن بە هەرا؛ هەراوزەناکردن؛ شەڕکردن.
(٢) خۆفشکردنەوە؛ خۆبادان؛ کەش‌وفش کردن؛ پۆزلێدان.
*n.* هەراوهوریا؛ هەراوزەنا.
**rufous** (rōō′fəs), *adj.* ژەنگی؛ سووری قاوەیی.
**rug** (rug), *n.* (١) بەڕە؛ مافوور؛ قاڵی؛ ڕاخەر؛ فەرش؛ ژێرەخەر؛ پەلاس؛ ڕایەخ. (٢) [British Chiefly]، سەرەخەری خوری یا بەتانیەی بچووك (بەتایبەتی بۆ دان بەسەر ئەژنۆدا).
**pull the rug ( out ) from under,** دەستبەرداربوون؛ فرۆشتن (مەجاز)؛ بەڕە لەژێر پێ دەرهێنان.
**sweep under the rug,** کردن بە ژێرەوە (شتی ناپەسەند)؛ داپۆشین؛ شاردنەوە.
**ruga** (rōō′gə), *n.* چرچ‌ولۆچ (زیندەوەرزانی، ڕووەکناسی).
**rugate** (rōō′gāt, rōō′git), *adj.* چرچ‌ولۆچاوی.
**Rugby** (rug′bi), *n.* ڕەگبی: فوتبۆڵێنی ئینگلیزی؛ جۆرێکە لە یاری شەق شەقێن. (پێشی دەوترێ: " **Rugby football** ").
**rugged** (rug′id), *adj.* (١) ناڕێك؛ سەخت؛ قۆرتاوی؛ بەرزو نزماوی؛ چاڵ‌وچۆڵاوی: *( ~ ground; ~ mountains)*.
(٢) چاڵ‌وچۆڵاوی؛ ناڕێك‌وپێك؛ بەهێزو پیاوانە (ڕووخسار): *( a ~ face)*.
(٣) زریاناوی؛ باوبۆراناوی؛ سەخت: *( ~ weather)*.
(٤) ناساز؛ ناخۆش: *( ~ tones)*.
(٥) سەخت؛ ناخۆش؛ توندوتیژ: *( a ~ life; a ~ climate)*.
(٦) کێوی‌یانە؛ کەرتڕانە؛ نەزان (ڕەووشت)؛ بێ نەزاکەت: *( ~ manners)*.
(٧) بەهێز؛ تەندرووست.
-**ruggedly** *(adv.)*; **ruggedness** *(n.)*.
**rugose** (rōō′gōs, rōō-gōs′), *adj. Also* **rugose,** چرچ‌ولۆچاوی؛

دەماراوی (گەڵا)؛ زبر: *( a ~ leaf)* .
**-rugosity** *(n.)*.
**ruin** (rōō′in, rōō′′n), *n.* (١) ڕووخان (خانوو)؛ ڕمان.
(٢) (*pl.*) . کەلاوە؛ وێرانە؛ کاول.
(٣) (ا) شوێنی وێران کراو یا کاول کراو؛ شوێنی ڕووخاو یا فەوتاو:
*( The bombed city was a ~ .)*
(ب) کەسێکی ڕووخاو یا فەوتاو.
(٤) فەوتان؛ ڕووخان؛ وێران بوون؛ تێکچوون؛ کاول بوون؛ لە کەڵك کەوتن؛
هەرەس بردن (مرۆڤ).
(٥) فەوتان (مرۆڤ)؛ مایەپووچی؛ نابووتی.
(٦) نابڕووچوون (کچ)؛ حەیاچوون؛ کون کران.
(٧) فەوتێنەر؛ وێرانکەر؛ هۆی فەوتان یا تێکدان:
*( Gambling was his ~ .)*
*v.t.* (١) وێران کردن؛ کاول کردن؛ فەوتاندن؛ ڕووخاندن؛ تێکدان؛
لە کەڵك خستن؛ بەرپاکردن:
*( It will ~ the crops.; to ~ a plan, a meal, one's chance, one's life, etc.)*
(٢) مایەپووچ کردن؛ نابووت کردن.
(٣) کون کردن (کچ)؛ نابڕووبردن.
*v.i.* وێران بوون؛ فەوتان؛ کاول بوون؛ مایەپووت بوون.
**ruinate** (rōō′ə-nāt′), [Archaic], *v.t. & v.i.* = **ruin**.
*adj.* = **ruined.**
**ruined** (rōō′ind), *adj.* وێران کراو؛ کاول بوو؛ فەوتاو؛ مایەپووت؛
نابڕووچوو
**ruination** (rōō′ə-nā′shən), *n.* (١) (ا) وێران کردن؛ فەوتاندن؛
تێکدان؛ کاول کردن؛ لە کەڵك خستن. (ب) وێران؛ فەوتاو؛ فەوتاوی؛
مایەپووتی؛ تێکچوون. (٢) فەوتێنەر؛ وێرانکەر؛ کاولکەر؛ نابووتکەر:
*( Drinking was his ~ .)*
**ruinous** (rōō′in-əs, rōō′′n-əs), *adj.* (١) وێران بوو؛ فەوتاو؛
ڕووخاو؛ کەڵك نەماو؛ کاول. (٢) وێرانکەر؛ کاولکەر؛ فەوتێنەر؛ زیانبەخش:
*( ~ floods)*
**rule** (rōōl), *n.* (١) پەیڕەو (٢) دەستوور؛ یاسا؛ ڕێسا.
(٣) پێوانە؛ کێشانە.
(٤) شتێك کە بە ئاسانی ڕوودەدات؛ ڕێبازی ئاسایی:
*( Famine and disease are the ~ following war.)*
(٥) فەرمانڕەوایی؛ حوکمڕانی؛ فەرمانداری: *( the ~ of King George)* .
(٦) ڕاستە. (٧) [Obs.]، ڕەفتار، ڕەووشت.
(٨) فەرمانی دادپرس؛ فەرمانی دادگا.
(٩) تیرە ئاسنێکی باریکە بۆ هێڵ ڕاکێشان (چاپەمەنی).
*v.t.* (١) ڕابەری کردن؛ بردن بەڕێوە؛ ڕاندن.
(٢) دەسەڵات بەسەردا بوون؛ لەژێر بار یا دەسەڵاتدا بوون.
(٣) کەمکردنەوە؛ ڕاگیرکردن؛ ڕاگرتن؛ بەستنەوە.
(٤) فەرمانڕەوایی کردن؛ حوکمڕانی کردن؛ بردن بەڕێوە:
*( The King ~d the country.)*
(٥) گرنگترین بەش بوون.
(٦) بڕیار لەسەردان (دادپرس، دادگا).
(٧) بە ڕاستە ڕاکێشان.
*v.i.* (١) فەرمانڕەوایی کردن؛ حوکمڕانی کردن.
(٢) لە پلەیەکی تایبەتیدا بوون (نرخ): *( Prices ~ low.)* .
(٣) بڕیار لەسەردان (دادپرس، دادگا):
*( The court has not ~d on the matter yet.)*
**as a rule,** بە ئاسایی: بە گشتی؛ بە زۆری
**rule out,** ڕێ نەدان بە قسە لێکردن یا ڕوودانی شتێك؛
بڕیاردان بە نەبوونی شتێك:
*( He ruled out any compromise or negotiation.)*

**rule of thumb,** پەیڕەو یا ڕێگەی کردنی شتێکە کە مرۆڤ بە
تاقیکردنەوە شارەزای بووە نەك لە ڕێی زانستەوە.
**ruler** (rōōl′ẽr), *n.* (١) فەرمانڕەوا؛ فەرماندەر. (٢) ڕاستە.
**ruling** (rōōl′iŋ), *adj.* (١) فەرمانڕەوا؛ فەرماندەر:
*( the ~ party, class, etc.)*
(٢) زاڵ؛ بەدەسەڵات.
*n.* (١) فەرمانڕەوایی کردن؛ حوکمڕانی کردن؛ جڵەوگرتن.
(٢) بڕیاری دادپرس یا دادگا:
*( A ~ by the court is expected today.)*
(٣) بە ڕاستە پێوان؛ ڕاستە بەکارهێنان؛ بە ڕاستە هێڵ کێشان.
(٤) هێڵی بە ڕاستە کێشراو.
**rum** (rōōm), *n.* (١) ڕەم: جۆرە خواردنەوەیەکی کحولییە.
(٢) خواردنەوەی سەرخۆشکەر.
**rum** (rum), *adj.* [Slang], (١) باش؛ نایاب.
(٢) [Chiefly British]، سەیر؛ ناوێزە؛ نائاسایی؛ جیا.
(٣) هیچوپووچ؛ گەند: *( a ~ joke)* .
**rum** (rum), *n.* = **rummy.**
**Rumanian** (rōō-mā′ni-ən), *adj. & n.* = **Romanian.**
**rumba** (rum′bə), *n.* (١) ڕومبا: سەمایەکی بەجۆشی کوبایی و
قولەڕەشییە. (٢) سەمایەکی لاساییکەرەوەی ئەم سەمایەیە.
(٣) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**rumble** (rum′b'l), *v.i.* (١) گرمەگرم هاتن؛ گرموهووڕ هاتن؛
گرماندن: *( Thunder ~s.)* .
(٢) بە گرموهووڕ ڕۆیشتن؛ گرمەهاتن؛ گرمەگرم کردن:
*( The truck ~d down the street.)*
(٣) [Slang]، شەڕە گەڕەك کردن.
*v.t.* (١) گرمە لێ هەڵساندن.
(٢) بە گرمەگرم وتن یا دەربڕین؛ هاوارکردن؛ گرماندن.
(٣) ساف و لووس کردنی پارچەیەکی کانزایی لە بەرمیلێکی سووڕاوەدا.
*n.* (١) گرمە؛ گرمەگرم؛ گرموهووڕ؛ هاڕە.
(٢) کورسی پشتەوەی گالیسکە (بۆ شتومەك یا بەردەست).
(٣) کورسییەکی وەهای پشتەوەی ئوتومبیل.
(٤) بەرمیلێکی خولاوەیە بۆ ڕێك کردن یا ساف و لووس کردنی پارچەی کانزایی
(٥) [Slang]، شەڕە گەڕەك؛ شەڕی تاقمە شەلاتی.
**-rumbly** *(adj.)*.
**rumen** (rōō′min), *n.* گەدەی یەکەمی گیانداری کاوێژکەر.
**ruminant** (rōō′mə-nənt), *adj.* (١) کاوێژکەر.
(٢) هی گیانداری کاوێژکەر؛ کاوێژکەری. (٣) بیرکەرەوە.
*n.* گیانداری کاوێژکەر.
**ruminate** (rōō′mə-nāt′), *v.i. & v.t.* (١) کاوێژکردن.
(٢) بیرلێکردنەوە.
**-ruminative** *(adj.)*; **ruminator** *(n.)*.
**rumination** (rōō′mə-nā′shən), *n.* (١) کاوێژ؛ کاوێژکردن.
(٢) بیرکردنەوە.
**rummage** (rum′ij), *n.* (١) پڕوپیت؛ وردە بابەت؛ شتی هەمەڕەنگ یا
هەڕەمە. (٢) پشکنین؛ بە وردی گەڕان. (٣) **rummage sale**.
(٤) [Obs.]، (ا) شێوەی ڕێکخستنی باری کەشتی. (ب) عەمار.
*v.t.* (١) پشکنین؛ بە وردی پیاگەڕان:
*( to ~ a ship for contraband)*
(٢) ( **~ up ; ~ out** ) ، خستنەڕوو (بە پشکنین یا بۆ گەڕان)؛ دەرخستن.
*v.i.* پشکنین؛ بە وردی گەڕان:
*( The burglars ~d through all his belongings.)*
**rummage sale,** (١) فرۆشتنی هەڕەمە: فرۆشتنی شتوومەکی هەڕەمەی
کۆنەو تازەی ناومالّو جلوبەرگ (بۆ پارە کۆکردنەوەو دان بەخێر).
(٢) فرۆشتن یا هەڕاجی هەڕەمەی فرۆشگا.

**rummer** (rum′ẽr), *n.* پەرداخ یا کوپێکی گەورە.
**rummy** (rum′i), *adj.* [Chiefly British Slang]. سەیر؛ جیا؛ ناوێزە؛ ناناسا.
*n.* ڕەمی: جۆرە یارییەکی کاغەزە.
**rummy** (rum′i), *n.* [Slang], سەرخۆش: کەسێکی سەرخۆش.
**rumor** (rōō′mẽr), *n. Also* **rumour,** ووتو وات؛ قاو؛ مقۆمقۆ؛ دەبدەبە؛ تەحا تەحا؛ بەندوباو؛ قاوەقاو.
*v.t.* قاو خستنەوە؛ قاو بلاوکردنەوە.
**rumour** (rōō′mẽr), *n. & v.t.* = **rumor.**
**rump** (rump), *n.* (١) کەفەلی گیاندار؛ پاشەڵ؛ سمت.
(٢) پارچە گۆشتی ڕانی گا. (٣) سمتە جۆلەی باڵندە.
(٤) سمتی مرۆڤ؛ کەفەڵ؛ گووپی سمت؛ گووپی قنگ؛ قنگ.
(٥) پاشماوە؛ پاشەڕۆک.
(٦) پاشەڕۆکی پەرلەمان (کە ئەندامە بنەڕەتییەکانی زۆربەیان نەمابن یا دەرکرابن).
**rumple** (rum′p'l), *n.* چرچ‌ولۆچ؛ ژاکاوی.
*v.t. & v.i.* چرچ‌ولۆچ کردن؛ ژاکاندن.
**rumpus** (rum′pəs), *n.* [Colloq.], هەراوزەنا؛ هەراهەرا؛ هەراو بەزم؛ شەڕ؛ شەڕو هەرا؛ دەنگەدەنگ
**rumpus room,** ژووری یاری (لە ژێرخاندا).
**rumrunner** (rum′run′ẽr), *n.* (١) قاچاخچی مەی و ئارەق.
(٢) کەشتی و بەلەمی قاچاخچێتی وەها.
**run** (run), *v.i.* (١) ڕاکردن
(٢) خێرا ڕۆیشتن؛ چوون بە دەم یا هاوارەوە: *( We ~ to her aid.)* .
(٣) بەرەڵابوون؛ ڕێ لێ نەگیران؛ بە سەربەستی گەڕان.
(٤) هەڵهاتن؛ هەلاتن؛ دەربازبوون؛ ڕاکردن؛ خۆدزینەوە.
(٥) ( **~ up to ; ~ down to ; ~ over to** )، بە پەلە چوون بۆ شوێنێکی نزیك بۆ ماوەیەکی کەم: *( Let's ~ over to her house.)*
(٦) (ا) بۆربۆڕێن کردن؛ پێشبڕکێ کردن: *( His horse ran in the race.)* .
(ب) خۆ نامزەدکردن (هەڵبژاردن)؛ خۆ پاڵاوتن لە هەڵبژاردنێکدا:
*( He will ~ in the next election.)*
(٧) تەواوکردنی غارغارێنێك یا پێشبڕکێیەك لە پلەیەکی تایبەتیدا:
*( My horse ran last.)*
(٨) کۆچ کردن (ماسی)؛ بە کۆمەڵ و بە مەلە ڕۆیشتن:
*( The Salmon ~ every year.)*
(٩) هاتوچۆکردن بە ڕێك‌وپێکی: *( The bus ~s every hour.; The train ~s between Washington and New York.)*
(١٠) بلاوبوونەوە (دەنگوباس).
(١١) خۆ پیاهەڵواسین؛ پیاهەڵگەڕان؛ تەرز فرێدان:
*( The vine ~s over the porch.)*
(١٢) گەڕانەوە بۆ چەندەها ساڵ؛ درێژبوونەوە بۆ ماوەیەکی کۆن لە ڕابوردوودا:
*( His family live ~s back many generations.)*
(١٣) هەمیشە بزووتن؛ هەرگیز نەوەستان:
*( His tongue ran on and on.)*
(١٤) هەڵوەشان: *( Her stocking ~.)* .
(١٥) گەڕان (مەکینە)؛ کارکردن:
*( The washing machine is ~ning.; Her car ~s well.)*
(١٦) هاتنەوە بە بیردا؛ هاتنەوە بە مێشکدا جار لە دوای جار:
*( Thoughts ran in his head.)*
(١٧) پێدا ڕۆیشتن؛ ڕۆیین (ئاو، خوێن، شلە): *( Blood ~s in his veins.)* .
(١٨) تووانەوەو لەبەر ڕۆیشتن: *( The butter ran .)* .
(١٩) (ا) بلاوبوونەوە (شلە)؛ ڕۆیین. (ب) ڕەنگ دانەوە (قوماش، جل).
(٢٠) پڕبوون لە (فرمێسك، خوێن، شلە)؛ لێ هەڵنیشتن:
*( Her eyes ran with tears.)*
(٢١) (ا) لێهاتن (کێم، چڵم، ئاو)؛ پیا هاتنەخوارەوە:
*( His nose is raning.)*
(ب) ئاو لێچوون (بەلووعە)؛ ئاو دزین؛ ئاو لێهاتن.
(٢٢) تێپەڕبوون (کات)؛ بوون بە؛ بەسەرچوون و بوون بە:
*( The days ran into weeks.)*
(٢٣) (ا) بەردەوام بوون؛ بە بەردەوام پیشان دران یا پێشکەش کران:
*( The play ran for a year.)*
(ب) خایاندن؛ پێ چوون: *( The movie ~s for two hours.)* .
(٢٤) کار پێ کران: *( The law ~s for ten years.)* .
(٢٥) درێژبوونەوە: *( The fence ~s through the woods.)* .
(٢٦) تووش بوون؛ تێکەوتن (قەرز، گیروگرفت):
*( He always ran into trouble.; We ran into debt.)*
(٢٧) بە شێوەیەك بوون: *( The proverb ~s like this.)* .
(٢٨) بە بنەچە بۆ مانەوە: *( Humor ~s in his family.)* .
(٢٩) بە نرخێکی تایبەتی بوون؛ لە ڕادەیەکی تایبەتیدا بوون.
*v.t.* (١) پیا ڕاکردن یا ڕۆیشتن بە خێرایی: *( to ~ streets)* .
(٢) پێشبڕکێ کردن؛ بۆڕبۆڕێن کردن: *( He ran a race.)* .
(٣) خۆ دان بە دەم مەترسییەوە؛ پڕکێشی کردن: *( to ~ a risk)* .
(٤) پیا ڕۆیشتن؛ شکاندن (ئابڵووقە)؛ بڕین (چرای سووری سەر ڕێگە):
*( The ship ran the blockade.; The driver ran a red light.)*
(٥) ڕاوکردن؛ دووکەوتن؛ ڕافڕاندن.
(٦) دوورینەوە؛ تەقەڵ لێدان. (٧) ملەملێ لەگەڵ کردن.
(٨) (ا) بەشداری پێکردنی ئەسپ لە غارغارێندا؛ پێشبڕکێ پێکردن
(ب) ئامزەدکردن؛ پاڵاوتن (بۆ هەڵبژاردن):
*( The party will ~ a new candidate in the next election.)*
(٩) کارپێکردن؛ خستنە ئیش (مەکینە، ئوتومبیل)؛ خستنەگەڕ:
*( to ~ a motor, engine, etc.)*
(١٠) تووش کردن: *( His action ran us into difficulties.)* .
(١١) (ا) گواستنەوە (بە کەشتی یا ئوتومبیل)؛ بردن؛ گەیاندن.
(ب) قاچاخچێتی کردن؛ بە قاچاخ دەرکردن: *( He ~s rifles.)* .
(١٢) پیاکردن: *( She ran a pin into her thumb.)* .
(١٣) تێکردن: *( to ~ water into a tub)* .
(١٤) لەبەر ڕۆیشتن (شلە)؛ لێ هەڵنیشتن؛ لێهاتن؛ پیا ڕۆیشتن:
*( The gutters ~ blood.)*
(١٥) (ا) بەردەوام بوون: *( They ran the film for a month.)* .
(ب) دەستپێکردن و دەوام پێدان: *( He ran a bill at the store.)* .
(١٦) بلاوکردنەوە (ڕۆژنامە، تەلەفزیۆن):
*( to ~ an advertisement, a story, etc.)*
(١٧) ڕاکێشان (ڕێگە)؛ بردن: *( to ~ a road into the hills)* .
(١٨) بەڕێوەبردن؛ هەڵسووڕاندن؛ گێڕان (کار):
*( to ~ a household, hotel, restaurant, corporation, etc.)*
(١٩) کردن (تاقیکردنەوە)؛ پێ هەڵسان: *( to ~ a test)* .
(٢٠) کێشان (هێڵ)؛ ڕاکێشان.
(٢١) تواندنەوەو پوختەکردن (کانزای خاو).
(٢٢) لێهاتن (تا)؛ تووش بوون: *( He is ~ing a fever.)* .
(٢٣) داڕشتن.
(٢٤) بردنەوە (یاری بلیارد).
*n.* (١) (ا) ڕاکردن؛ خێرایی وەك ڕاکردن. (ب) غار.
(٢) ڕاکردن.
(٣) (ا) ماوە یا دووری ڕاکردنێك.
(ب) ماوە یا کاتی پێویست بۆ ئەم ڕاکردنە:
*( a two minute's ~ from the bus-stop)*
(٤) گەشتێکی کورت و خێرا؛ سەردانێکی کورج؛ چوون: *( a ~ into town)* .
(٥) (ا) دابەشکردنی فرۆتەنی بەسەر ئەو ماڵ و فرۆشگایانەدا کە داوایان کردووە؛ ئەو ڕێگەیەی لەم دابەشکردنەدا دەگیرێ:
*( The milkman finished his ~ .)*

(ب) ڕێگەی هاتوچۆی ڕێكوپێكی هۆی هاتوچۆ.

(ج) ماوەی ئەم ڕێگەیە (كاتو دووری).

(٦) بۆ پێشەوە ڕۆیشتن (بەتایبەتی هی ئاسان).

(٧) چۆنێتی درێژبوونەوەی دەماری دارو تەختەو بەرد.

(٨) زنجیرە: *( a ~ of good luck ; a ~ of dry summers)* .

(٩) زنجیرە (شانۆنامە پێشكەش كردن):

*( The play had a ~ of a year.)*

(١٠) چەند نۆتە یا ئاوازێكی مۆسیقای خێرا خێراو یەك لەدوای یەكە.

(١١) تێكچڕان (مەعمیلی بانق بۆ پارە وەرگرتن)؛ هێرش:

*( There was a ~ on the bank.)*

(١٢) درێژبوونەوە؛ بەردەوامی.

(١٣) لێشاو؛ بەرزاو؛ ئاو هەڵنیشتن؛ تەووژم.

(١٤) جۆگەلەی خێرا.

(١٥) (ا) لەبەر ڕۆیشتن (شلە)؛ ڕۆیشتنی ئاو یا شلەی تر.

(ب) هەندی ئەم ڕۆیشتنە.

(١٦) (ا) گەڕانی كارخانە یا مەكینەیەك بۆ ماوەیەكی تایبەتی.

(ب) بەرهەمی ئەم ماوەیە.

(١٧) (ا) بابەت (شتومەك)؛ چەشن؛ جۆر (مرۆڤ، گیاندار...هتد).

(ب) بابەتی ڕەمەكی یا بازاڕی؛ جۆری ئاسایی.

(١٨) (ا) بۆری؛ ڕێ؛ ڕێچكە؛ جۆگە.

(ب) كۆز؛ لانە؛ پەچە: *( a chicken ~ ; a rabbit ~ )* .

(١٩) بەرەلایی؛ سەربەستی سووڕانەوە یا گەڕان:

*( We had the ~ of his yard.)*

(٢٠) ڕەوە؛ گەل (مێگەل، گاگەل).

(٢١) ڕێی كۆچ یا گەرمیانو كوێستان كردن؛ ناوچەی تێدابوونو هاتوچۆكردن:

(٢٢) (ا) گەلە ماسی كۆچكەر (بۆ گەراكردن).

(ب) كۆچ كردنی وەهای ماسی.

(٢٣) تاڵی هەڵوەشاو یا ڕەویوە (قوماشو جلی تەنراو)؛ هەڵوەشانەوە؛ ڕەوینەوە

(٢٤) بەرەو نیشان چوونو نیشان لێگرتنی فڕۆكەی بۆمباهاوێژ:

*( a bombing ~ )*

(٢٥) لە تۆپ دانی یەك لەدوای یەكو بردنەوە (یاری بلیارد).

***adj.*** (١) تواوە

(٢) داڕێژراو: *( ~ metal)* .

(٣) پالاوتە؛ پاڵێوراو؛ پوخت: *( ~ honey)* .

(٤) قاچاخ؛ هی قاچاخ: *( ~ liquor)* .

**a run for one's money,** (١) ملەملانێی گران؛ بە ئاسانی دەست نەكەوتن. (٢) خۆشی لێ وەرگرتن؛ شت لێ دەست كەوتن.

**in the long run,** لە مەودای دووردا؛ لە دواییدا:

*( He may win now, but in the long run he will lose.)*

**on the run,** (١) ڕاكردوو؛ ڕافڕێنراو؛ شكاوەو لە ڕاكردندایە:

*( We have the enemy on the run now.)*

(٢) ڕاكەڕاك دەكات؛ هەڵپە دەكات بە هەموولایەكدا:

*( I have been on the run all day.)*

(٣) قاچاخ (مرۆڤ)؛ ڕاكردوو: *( The thief is on the run.)* .

**run across,** تووش بوون بە ڕێكەوت؛ پێ گەیشتن.

**run after,** (١) شوێن كەوتن؛ دواكەوتن؛ بەدوادا ڕاكردن.

(٢) [Colloq.]، شوێن كەوتن بۆ بوون بە برادەر؛ داوای برادەرێتی لێكردن؛ ڕاكردن بەدوادا.

**run along,** ڕۆیشتن؛ ڕۆین؛ كەوتنەڕێ.

**run an errand,** كارێكی سەرڕێیی بچووك كردن (چوونە بازاڕ یا بانق).

**run away with,** (١) دزین؛ بردن (٢) ڕەدووكەوتن.

(٣) بە پەلە پەسەندكردن (بیروڕا، پلان).

(٤) خۆ بۆ نەگیران؛ هەڵچوون: *( His temper ran away with him.)* .

(٥) (ا) بۆربێدان؛ بۆربۆرێن بردنەوە.

(ب) خەڵات بردنەوە: *( He ran away with several prizes.)* .

**run down,** (١) پەككەوتن (مەكینە)؛ وەستان.

(٢) كردن بە ژێرەوە:

*( The policeman ran down a few demonstrators with his motorcycle.)*

(٣) ڕاونانو گرتن یا كوشتن؛ ڕاوكردن؛ شوێن كەوتنو دۆزینەوەو گرتن

(٤) شكاندن (مرۆڤ)؛ ناو پیس كردن؛ خراپە ووتن؛ بە سووكی ناوبردن؛ سووك كردن: *( He was trying to run her down.)* .

(٥) (ا) ماندووكردن؛ ماندووبوونو تەندرووستی خراپ بوون.

(ب) پەڕپووت كردن؛ چاك نەكردنو فەرامۆش كردنو تێكوپێكدان

*( The tenants run down the house.)*

(٦) خێرا خوێندنەوە؛ بە پەلە چاو پێداخشان

**run for it,** دەربازبوون؛ هەڵهاتن؛ ڕاكردن

**run in,** (١) خستنەناو یا سەر (نووسینی زیادە)؛ تێ ترنجاندن.

(٢) [Slang]، گرتن؛ گرتنو خستنە بەندیخانەوە.

(٣) لەچاپدان بەبێ جیاكردنەوە بە بەند بەند.

**run into,** (١) بە ڕێكەوت تووش بوون؛ پێ گەیشتن:

*( I run into some friends in the store.)*

(٢) خۆ پیادان؛ بەركەوتن؛ بەیەكدادان.

(٣) لێدان (ڕێگە)؛ لەیەكتردان.

(٤) تووش بوون: *( to run into difficulties, debts, etc.)*

**run off,** (١) بە پەلە ڕۆیشتن؛ ڕاكردن

(٢) وێنە لەسەر دەركردن؛ لەچاپدان:

*( to run off ten copies on the Xerox machine)*

(٣) نووسینەوە یا خوێندنەوەی لیستە ناو بە خێرا.

(٤) دزینو بۆ دەرچوون؛ فڕاندن؛ ڕاكردن:

*( He robbed a bank and ran off with a lot of money.)*

(٥) دووبارەكردنەوەی هەڵبژاردن لەنێوان دوو كەسدا كە لە هەموو ئەوانی تر دەنگیان زیاتر هێناوە: *( There will be a run-off election.)* .

**run on,** (١) لەچاپدان بەبێ جیاكردنەوە بە بەند بەند.

(٢) لەیەكدرانی چەند ڕستەیەك بە هەڵە بەبێ وەستان (ڕێزمان).

(٣) لەسەر ڕۆیشتن؛ قسەكردن بەبێ وەستان

**run out,** تەواوبوون؛ بەسەرچوون (كات)؛ دوایی هاتن؛ هیچ نەمان:

*( Time ran out.)*

**run out of,** لێ بڕان (ئازووقە، شتومەك، كەرەسە)؛ هیچ پێ نەمان:

*( We ran out of time and money.)*

**run over,** (١) كردن بە ژێرەوە:

*( He almost ran her over with his car.)*

(٢) هەڵچوون؛ لێ ڕژان؛ لەبەر ڕۆیشتن.

(٣) پیاچوونەوە بە پەلە؛ پەراوەكردن.

(٤) لێ تێپەڕبوون.

**run the show,** جڵەو بە دەست بوون؛ بەڕێوەبردن.

**run through,** (١) بەفیڕۆدان (پارە)؛ لەناوبردن؛ بە بادان.

(٢) لێدان (چەقۆ، شیر)؛ پیاكردن؛ كون كردن.

(٣) پیاچوونەوە بە پەلە؛ پەراوەكردن. (٤) هێڵ پیاهێنان (نووسراو).

**run up,** (١) بەرزكردنەوە؛ هەڵكردن: *( to run up a flag)* .

(٢) درووستكردن بە پەلە. (٣) كۆكردنەوە (ژمارە).

(٤) زیادە خەرجی كردن؛ زیادكردن (حساب، خەرجی):

*( He ran up a big bill at the hotel.)*

**run up against,** تووش بوون:

*( to run up against difficulties)*

**run upon,** (١) خۆ پیادان؛ لێدان:

*( The ship ran upon a rock.)*

(٢) دۆزینەوە بە ڕێكەوت؛ تووش بوون؛ پێ گەیشتن.

**runabout** (run'ə-bout'), *n.* (١) گەڕۆك؛ كەسێكە كە دەسووڕێتەوە

به شوێن ڕابواردندا؛ ڕاکەڕاککەر (٢) گالیسکەیەکی سووکی یەك کورسی سەرکراوە. (٣) ئوتومبیلێکی سووکی سەرکراوەی یەك کورسی.
(٤) بەلەمێکی بچووکی ماتۆڕدار

**runagate** (run′ə-gāt′), *n.* (١) کەسێکی هەڵهاتوو یا قاچاخ؛ کەسێکی ڕاکردوو. (٢) گەڕۆك؛ ئاوارە؛ دەربەدەر.

**run-around** (run′ə-round′), *n. Also* **run-round,** (١) دەستی دەستی پێکردن؛ بەدەمەوەگرتن؛ ئاین‌وئۆین؛ ڕاستی بەدەستەوەنەدان؛ بیانوو:
*( to get the ~ from someone; to give someone the ~ )*
(٢) خانەیەکی چاپکراو بە تەسکی بەدەوری وێنەیەکدا (وەك لە فەرهەنگدا).

**runaway** (run′ə-wā′), *n.* (١) کەسێکی یاخی یا هەڵهاتوو؛ ڕاکردوو؛ هەلاتو؛ تۆراو. (٢) ئەسپی بەلەسە یا پەت پچڕێن.
(٣) ڕاکردن؛ هەڵهاتن؛ هەلاتن؛ تۆران؛ یاخی بوون؛ بەلەسەیی.
(٤) بردنەوەیەکی ئاسان؛ سەرکەوتنێکی ئاسان‌و یەکلایی.
*adj.* (١) ڕاکردوو؛ بەلەسە؛ پەت پچڕێن؛ تۆراو:
*( a ~ teenager ; a ~ horse)*
(٢) هی ڕاکەر؛ هی ڕاکردوو: *( a ~ marriage)*
(٣) بە ئاسانی براوە (بۆڕبۆڕێن، پێشبڕکێ).
(٤) زوو بەرزبووەوە (نرخ): *( ~ prices ; a ~ inflation)* .

**runcinate** (run′si-nit, run′si-nāt′), *adj.* گونچکە ئاڕێك‌و بە پشتدا کەوتوو (گەلا).

**rundle** (run′d'l), *n.* (١) پلە پەیژە (٢) چەرخ؛ ڕەورەوە؛ پێچکە

**rundlet** (rund′lit), *n.* (١) بەرمیلی بچووك
(٢) پێوانەیەکی شلەی کۆنە بریتی‌یە لە هەژدە گالۆن.

**run-down** (run′doun′), *adj.* (١) قورمیش نەکراو و وەستاو (کاتژمێر). (٢) ماندوو؛ لە پەل‌وپۆ کەوتوو؛ بێ هێزو ناتەندرووست (لەبەر زۆر ئیش کردن)؛ لاواز. (٣) پەڕپووت؛ چاك نەکراو و گوێ پێ نەدراو؛ ڕووخاو:
*( a ~ building)*
*n.* کورتە؛ پوختە.

**rune** (rōōn), *n.* (١) ڕوون: تیپی ئەلف‌وبێیەکی کۆنی ئەسکەندنافی و نەتەوە ئەڵمانی‌یەکانی ترە (٢) هەڵبەست، مەتەڵ، یا شتێکی تری بەم ئەلف‌وبێیە نووسراو. (٣) نیشانە یا شێوە نووسینێکی ئەفسوونیی.
(٤) (ا) هەڵبەستی فنلەندی. (ب) هەڵبەستێکی ئەسکەندینافی کۆن.
(ج) [Poetic]. هەڵبەست؛ گۆرانی.
**-runic** *(adj.).*

**rung** (ruŋ), *n.* (١) پلە پەیژە
(٢) داری نێوان دوو قاچی کورسی؛ داری پاڵپشتی کورسی.
(٣) تەل پێچکەی پاسکیل (٤) پلە

**rung** (ruŋ), *past participle and rare past tense of* **ring.**

**run-in** (run′in′), *adj.* تێ ترنجاو (ووتەی زیادەی ناو شتی نووسراو یا چاپکراو).
*n.* (١) ووتەی زیادەی تێ ترنجاو یا خراوە ناو شتی چاپکراو یا نووسراو.
(٢) [Colloq.]، شەڕ؛ دەمەقاڵێ؛ مشت‌ومڕ؛ شەڕە قسە؛ دەمەقڕێ:
*( She had a ~ with her boss.)*

**runlet** (run′lit), *n.* جۆگەلە

**runnel** (run′'l), *n.* (١) جۆگەلە (٢) ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕۆگە.

**runner** (run′ẽr), *n.* (١) (ا) ڕاکەر (ب) هەڵهاتوو؛ ڕاکردوو؛ قاچاخ.
(٢) پەیامبەر. (٣) (ا) قاچاخچی. (ب) بەلەم یا کەشتی قاچاخچی.
(٤) مەکینەچی؛ بەڕێوەبەر (ئامێر). (٥) فەرمانبەر (بانق).
(٦) (ا) بەرە یا قاڵی باریکی ڕاڕەو
(ب) سەرمێزی باریکی جوان (کە هەر بەشێکی مێزەکە دابپۆشێ).
(٧) تاڵی هەڵوەشاو؛ تاڵێك کە ڕەوییبێتەوە.
(٨) (ا) تەرزی خشۆکی ڕەگ داکوتاو (هەر ڕەگێکی دەبێتە ڕووەکێکی تازە).
(ب) ڕووەکێکی وەها (وەك شلیك). (٩) ڕووەکی پیاهەڵگەڕاوی تێوەئالاو.
(١٠) بنی پێلاوی سەهۆڵ خلیسکێ.
(١١) ئەو بەشەی ئامێرێك یا مەکینەیەکە کە بەشێکی تری پێدا دێت‌و دەچێت یا دەخلیسکێ.
(١٢) ئەو پارچە درێژەی بنی گالیسکەی سەهۆڵە کە لەسەری دەخلیسکێ.
(١٣) دارێژگە.
(١٤) جۆرە ماسی‌یەکە.

**runner-up** (run′ẽr-up′), *n.* هاوبڕکێکەری دوای براوە؛ هاوبڕکێکەری دووەم؛ براوەی دووەم.

**running** (run′iŋ), *n.* (١) ڕاکردن. (٢) توانای ڕاکردن.
(٣) هاوبڕکێ؛ بۆڕبۆڕێن: *( in the ~ )* .
(٤) بەڕێوەبردن؛ گێڕان؛ ئیش پێکردن؛ خستنەکار:
*( the ~ of a machine)*
(٥) (ا) ڕەوت (شلە)؛ ڕەوانی (ئاو)؛ ڕۆین؛ لەبەر ڕۆین.
(ب) ڕادەی شلەی لەبەر ڕۆییو.
*adj.* (١) ڕاکەر؛ خێرا ڕۆیشتوو.
(٢) هی ڕاکردن: *( a ~ race)* .
(٣) ڕەوان (ئاو)؛ نەوەستاو؛ ڕۆییو: *( ~ water)* .
(٤) پێکەوە نووساو (نووسین). (٥) تەواوە.
(٦) کێم لێهاتوو: *( a ~ sore)* .
(٧) هەڵگەڕاو (ڕووەك)؛ خشۆك.
(٨) لە گەڕدایە؛ ئیش دەکات (مەکینە): *( a ~ engine)* .
(٩) بە درێژی (پێوانە): *( a ~ foot)* .
(١٠) بەردەوام: *( a ~ fend between the two sides)* .
(١١) یەك لەدوای یەك: *( for seven days ~ )* .
(١٢) زاڵ.
(١٣) هی ئێستە؛ بەردەوام: *( a ~ account)* .
(١٤) خلیسکاو؛ شل؛ نەچەسپیو: *( a ~ knot)* .
(١٥) بە ڕاکردن کراو: *( a ~ jump)* .
**in the running,** لە هاوبڕکێکەدایە؛ لەوانەیە بیباتەوە.
**out of the running,** لە هاوبڕکێکەدا نی‌یە؛ لەوانە نی‌یە بیباتەوە (هەڵبژاردن، پێشبڕکێ، غارغارێن، یاری).

**running board,** چەملەغی ئوتومبیل.

**running gear,** بەشە جووڵاوەکان یا ئیشکەرەکانی ئوتومبیل‌و شتی تری خۆبزوێن (وەك گێڕو ئەکسل‌و مەکینەو پێچکەکانی).

**running head,** سەرباسی دووبارەکراوەیە لە لاسەرووی هەموو لاپەڕەیەکدا یا هەر لە تەوقەسەری لاپەڕەی چەپ. (پێشی دەووترێ: " running title ").

**running mate,** ئاوەڵی هاوبڕکێ: (ا) ئەسپی هاونیلە.
(ب) ئەسپێکە کە خێرایی بۆ ئەسپێکی تری غارغارێن دادەنێ یا دەبڕێتەوە.
(ج) کەسێکە کە ناودێر کرابێ بۆ پلەوپایەیەکی جێگری لەگەڵ کەسێکی تردا بۆ پلە سەرەکی‌یەکە (وەك جێگری سەرەك کۆمارو سەرەك کۆمار لە هەڵبژاردنێکدا):
*( Jonson was Kennedy's ~ in the 1960 election.)*

**running stitch,** ڕیزە تەقەڵی وورد.

**running title,** = **running head.**

**running water,** ئاوی بەلووعە؛ ئاوی ڕەوان.

**runny** (run′i), *adj.* (١) ئاو بە لووتدا هاتنەخوارەوە؛ چڵماوی:
*( a ~ nose)*
(٢) زۆر شل؛ شل: *( ~ yogurt, soup, etc.)* .

**run-off** (run′ôf′), *n.* (١) باراناو و بەفراوی هەڵنەمژراوی بەرەو جۆگەو ئاوەڕۆ چوو. (٢) چڵکاو و پیسایی کارگە.
(٣) کایەی بڕیاردەر؛ دوا کایەی بۆڕبۆڕێن، یاری، یا هەڵبژاردنێکە کە کەس نەیبردبێتەوەو بەرامبەر بن:
*( Since no one has won the election outright, there will be a ~ .)*

**run-of-the-mill** (run′əv-thə-mil′), *adj.* بازاڕی؛ ڕەمەکی؛ ئاسایی؛ سادە (نموونە).

**run-on** (run′on′), *adj.* (١) بەند بەند نەکراو (چاپەمەنی).
(٢) پێکەوە بەستراو بە هەڵەو بەبێ وەستان (ڕێزمان): ***( a ~ sentence)*** .
*n.* (١) شتی چاپکراوی بەند بەند نەکراوو جیانەکراوە.
(٢) ڕستەیەکە کە لە لێکدانی چەند ڕستەیەك پێکهاتووە بە هەڵە (ڕێزمان).
**runt** (runt), *n.* (١) (ا) کورتەبنە (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەك).
(ب) بچووکترین بەچکەی بە یەك سك زاو.
(٢) گاو مانگای بچووك.
**-runtiness** *(n.)*; **runty** *(adj.)*.
**runway** (run′wā′), *n.* (١) جۆگە؛ ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕێگە.
(٢) ڕێگەی شتی پێچکەدار. (٣) ڕێچکەی ئاسكو گیانداری تر.
(٤) ڕاڕەوی گەڕانەوەی تۆپی " بۆلینگ " پاش خل کردنەوەی.
(٥) ڕاڕەوی نێوان شانۆو شانۆخانە. (٦) ڕاڕەوی فڕینو نیشتنەوەی فڕۆکە.
(٧) کوز؛ پەچە؛ کولانە مریشك.
**rupee** (rōō-pē′), *n.* ڕووپیێ: پارەی هیندو پاکستانە.
**rupture** (rup′chēr), *n.* (١) شەق بردن؛ پچڕان؛ شەقو پەق بوون؛ دادڕ ن. (٢) پەیوەندی پچڕان (مرۆڤ، وولات)؛ پەیوەندی بڕان:
***( a ~ in their relations)***
(٣) قۆڕی
*v.t. & v.i.* (١) شەق پێ بردن؛ پچڕاندن؛ شەق بردن؛ لێك جیاکردنەوە.
(٢) قۆڕبوون
**rural** (roor′əl), *adj.* (١) دێهاتی؛ هی لادێ؛ هی دەرەوەی شار؛ دەشتەکی. (٢) لادێیی؛ هی خەڵکی لادێ. (٣) کشتوکاڵی.
**-ruralism** *(n.)*; **ruralist** *(n.)*.
**rurality** (roo-ral′ə-ti), *n.* (١) لادێیەتی؛ دەشتەکیتی؛ سادەیی.
(٢) تایبەخۆیەکی لادێ؛ دیمەنی لادێ؛ ڕەفتاری لادێیانە.
**ruralize** (roor′əl-īz′), *v.t.* وەك لادێ لێکردن.
*v.i.* چوونە لادێ؛ لەلادێ ژیان بۆ ماوەیەك.
**-ruralization** *(n.)*.
**ruse** (rōōz), *n.* فێڵ تەڵەکەبازی؛ کەڵەك؛ پەنگ؛ تەڵەکە؛ درۆ؛ ساختە؛ پیلان.
**rush** (rush), *v.i.* (١) پەلەکردن؛ بە پەلە شت کردن.
(٢) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
(٣) ( ~ into ) ، بە پەلەو سەرکێشانەو بێباکانە کردن:
***( to ~ into marriage)***
(٤) بە پەلە هاتن یا چوون؛ لە پڕ تێپەڕبوون یا ڕۆیشتن.
*v.t.* (١) بەپەلە بردن، ناردن، کردن، یا ڕۆیشتن:
***( They ~ed him out of the room.)***
(٢) پەلەلێکردن: ***( Don't ~ me.)*** .
(٣) (ا) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.
(ب) گرتن لە هێرشێکی وەهادا.
*n.* (١) پەلە
(٢) ووروژم؛ ووروژم بردنی خەڵك بۆ شوێنێك بەدوای پارە یا ئیشدا:
***( the gold ~ )***
(٣) ڕاکەڕاك؛ پەلەپەل؛ پەلە: ***( the ~ of modern life)*** .
(٤) هێرش؛ پەلامار.
(٥) بوونی قوتابی تازەی هەندێك زانکۆو دانشگای ئەمەریکی بە ئەندام لە یانەی تایبەتی زانکۆکەدا بە جەماوەری.
(٦) قەرەباڵغی؛ شپرزەیی و قەرەباڵغی.
(٧) بردنی تۆپ بەناو تیپی بەرامبەردا (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
(٨) (*pl.*) ، وێنەی پەلەی بەشێك لە فیلمێکی تازە گیراو بۆ بینینی لەلایەن دەرهێنەر یا سەرپەرشتیاری فیلمەکەوە.
*adj.* (١) هی پەلە؛ دەبێ بە پەلە جێبەجێ بکرێ؛ پەلە: ***( ~ orders)*** .
(٢) قەرەباڵغ: ***( ~ hour)*** .
**with a rush,** بە پەلە؛ لە پڕ.
**rush** (rush), *n.* (١) زەل: ڕووەکێکە لقەکانی دەکرێن بە حەسیرو سەبەتەو کورسی. (٢) ڕووەکێکی زەلکاوەکانە وەك زەل.
(٣) شتی هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ.
**rush hour,** کاتی قەرەباڵغی ڕێگەوبان؛ کاتی پڕبوونی ڕێگەوبانو شەقامەکانە لە ئوتومبیل بەهۆی خەڵك چوون بۆ ئیش یا هاتنەوەوە
**rush-hour** (rush′our), *adj.* هی کاتی قەرەباڵغی ڕێگە (ووشەی پێشوو ببینە): ***( ~ traffic)*** .
**rusk** (rusk), *n.* (١) چۆرەك.
(٢) جۆرێکە لە پسکویت.
**russet** (rus′it), *n.* (١) ڕەنگی قاوەیی؛ قاوەیی.
(٢) قوماشێکی قاوەیی زبرە.
(٣) جۆرە سێوێکی زستانەی قاوەیی سوورکاری توێکڵ ئەستوورە
*adj.* (١) قاوەیی.
(٢) لە جۆرە قوماشێکی زبری قاوەیی دروستکراوە.
**Russian** (rush′ən), *adj.* ڕوسی (گەل، زمان، کلتوور...هتد).
*n.* (١) ڕوسی؛ هاونیشتمانیەکی ڕوسیا. (٢) زمانی ڕوسی.
**rust** (rust), *n.* (١) ژەنگ
(٢) دانە دواوە؛ کەڕوو هەڵهێنانی مێشك (مەجاز)؛ تەمەڵی؛ خووی خراپ
(٣) ژەنگ (ڕەنگ)؛ قاوەیی سوورکار.
(٤) ژەنگی دانەوێڵە: نەخۆشیەکە ژەنگ بە دانەوێڵە هەڵدەهێنێ.
*v.i. & v.t.* (١) ژەنگ لێدان (دانەوێڵە).
(٢) ژەنگ گرتن؛ ژەنگ هەڵهێنان؛ ژەنگ لێدان.
(٣) دانە دواوە؛ ژەنگ هەڵهێنان (مەجاز)؛ کەڕوو هەڵهێنان:
***( His mind had ~ed.)***
(٤) ڕەنگی ژەنگ گرتن یا لێدان.
*adj.* ژەنگ (ڕەنگ)؛ قاوەیی سوورکار.
**-rustily** *(adv.)*; **rustiness** *(n.)*.
**rust-colored** (rust′kul′ērd), *adj.* ژەنگ (ڕەنگ)؛ قاوەیی سوورکار.
**rustic** (rus′tik), *adj.* (١) دێهاتی؛ هی لادێ؛ لادێیی؛ دەشتەکی؛ هی دەرەوەی شار. (٢) (ا) سادە؛ خاکی. (ب) گێل؛ نەزان؛ هیچ نەدیو.
(٣) لە دارو تەختەی توێکڵاویو زبر دروستکراو: ***( ~ furniture)***
(٤) لەهی لادێ دەچێ لە سادەییو خاکێتیو خنجیلەییو کۆنباویدا:
***( a ~ house, hotel, restaurant, etc.)***
*n.* لادێیی؛ کەسێکی سادەو نەزانو گێلۆکەو کێوی.
**-rustical** *(adj.)*; **rustically** *(adv.)*.
**rusticate** (rus′ti-kāt′), *v.i.* (١) چوونە لادێ. (٢) لەلادێ ژیان.
*v.t.* (١) ناردنە لادێ؛ بە زۆر لەلادێ دانان.
(٢) [British]، دەرکردنی قوتابی لە زانکۆ یا دانشگا بۆ ماوەیەك.
(٣) بە شێوەیەکی سادەو خنجیلەو کۆنباوو لادێیانە دروستکردن (خانووسازی).
**-rustication** *(n.)*; **rusticator** *(n.)*.
**rusticity** (rus-tis′ə-ti), *n.* (١) سادەیی؛ خاکێتی؛ نەزانی؛ گێلۆکەیی؛ کێوێتی. (٢) ژیانی لادێ؛ لادێیەتی.
(٣) کردەوەی لادێیانە؛ تایبەخۆ یا خووی لادێیانە.
**rustle** (rus′'l), *v.i. & v.t.* شنینەوەی گەڵا؛ شنەکردن؛ لەرینەوەی گەڵا؛ خشەهاتن
*n.* شنینەوەی درەخت؛ ورشەی گەڵاو جلی تازە؛ شنەی گەڵا: خشەخشی گەڵا.
**rustle** (rus′'l), *v.i. & v.t.* (١) (ا) بۆ گەڕان؛ هەوڵ بۆدان؛ کۆشش کردن.
(ب) بۆ خواردن گەڕان؛ خواردن لێ سەندن؛ بۆ ئالف گەڕان.
(٢) (ا) ڕاپێچانی ڕەشەووڵاخ. (ب) ڕەشەووڵاخ دزین.
**rustler** (rus′lēr), *n.* [Colloq.], (١) کەسێکی چالاكو هەوڵدەر.
(٢) ڕەشەووڵاخ دز.
**rustless** (rust′lis), *adj.* بێ ژەنگ؛ ژەنگی پێوە نییە.
**rust-proof** (rust′prōōf′), *adj.* ژەنگ نەگر؛ ژەنگ هەڵنەهێن.
**rusty** (rus′ti), *adj.* (١) ژەنگاوی؛ ژەنگن؛ ژەنگدار.

(۲) له ژەنگەوە پەیدابووە.
(۳) ژەنگی هەڵهێناوە (مەکینە)؛ باش کارنەکەر لەبەر ژەنگ.
(٤) ژەنگن (مەجاز)؛ شەق‌وشڕ؛ ئەوەندە باش ئی‌یە چونکە ماوەیەکە خراوەتە پشت گوێ‌و بەکار نەهاتووە:
*( His geometry is ~ .; My French is a little ~ .)*
(٥) ژەنگی؛ قاوەیی سوورکار.
(٦) ڕەنگ چووەوە یا تێکچوو؛ پەڕپووت.

**rut** (rut), *n.* (۱) شوێن پێچکەی ئوتومبیل‌و ماتۆڕسکیل.
(۲) قلیش؛ ئاودڕ؛ دێراو؛ کەندەك؛ کەندڕ.
(۳) ڕۆتین؛ ڕاهاتن بە کردنی شتێك یا بیرکردنەوە بە شێوەیەك‌و بۆ نەگۆڕان:
[ *to get in* ( or **into** ) *a* ~ ].

**rut** (rut), *n.* (۱) ئارەزووی پەڕین؛ ئارەزووی ئاسك‌و حوشترو بەران‌و سابرێن... هتد بۆ پەڕین. (۲) هاتنە تەگە؛ هاتنە با.
(۳) ماوەی ئەم بەبابوونە.
*v.i.* ئارەزوو هەڵسان بۆ پەڕین (کەڵە ئاسك، بەران، سابرێن... هتد).
*v.t.* سواربوون؛ پەڕین؛ جووت بوون.

**rutabaga** (rōō´tə-bā′gə), *n.* سەلکی ڕووەکێکە شێوەو تامەکەی لە شێلم دەچێت؛ شێلمە زەردە.

**ruth** (rōōth), *n.* [Archaic], (۱) بەزەیی؛ بەزەیی پیاهاتنەوە؛ دڵ پێ سووتان (۲) داخ‌و خەفەت؛ پەشیمانی

**ruthenic** (rōō-then′ik), *adj.* ڕوتینیۆمی (وشەی داهاتوو ببینە).

**ruthenium** (rōō-thē′ni-əm), *n.* ڕوتینیۆم؛ توخمێکی کانزایی خۆڵەمێشی‌یە (کیمیاگەری).

**ruthful** (rōōth′fəl), *adj.* [Archaic], (۱) دڵتەنگ؛ مات‌ومەلوول؛ خەفەتبار. (۲) بە بەزەیی؛ دڵنەرم؛ بەڕەحم.
(۳) دڵ پێی دەسووتێ؛ بافتی بەزەیی پیاهاتنەوەیە.

**ruthless** (rōōth′lis), *adj.* بێ بەزەیی؛ دڵ سەخت؛ دڵڕەق؛ بێ ڕەحم.

**rutilant** (rōō′ti-lənt), *adj.* [Rare], درەوشاوە؛ بریقەدار.

**ruttish** (rut′ish), *adj.* بەخرۆش؛ بەئالۆش؛ بەبا.

**rutty** (rut′i), *adj.* قلیش قلیشاوی؛ کەندڕاوی؛ درزاوی:
*( a ~ road)*
-**ruttiness** *(n.).*

**rye** (rī), *n.* (۱) حەوینج (۲) ویسکی حەوینج.

**rye** (rī), *n.* پیاوە قەرەج

**rye grass,** زیبزانە؛ مرور.

**rye whiskey,** ویسکی حەوینج.

# S s

**S, s** (es), ***n.*** (١) تیپی نۆزدەهەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزی‌یە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە " ئێس ".
(٣) (ا) قاڵبی ئەم تیپە. (ب) ئەم تیپە بە چاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) نیشانەی ژمارەی نۆزدەهەمینی ڕستەیەکە؛ نۆزدەهەم.
***adj.*** (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) نۆزدەهەم؛ نۆزدەهەمین.
**S (es),** ***n.*** (١) شتێکە لەشێوەی تیپی " S " دا.
(٢) ژمارە " ٧ " یا " ٧٠ "ی ڕۆمانی.
***adj.*** لە تیپی " S " دەچێت.
**sabadilla** (sab′ə-dil′ə), ***n.*** (١) ڕووەکێکی تۆو ژەهراوی ناوچە گەرمەکانە. (٢) تۆوی ئەم ڕووەکە.
**sabbatarian** (sab′ə-târ′i-ən), ***adj.*** شەممەیی: تایبەتی بە ڕۆژی شەممە، واتە ڕۆژی حەوانەوەی جوولەکە.
***n.*** (١) شەممەیی: پەیڕەویکەری نەریتی حەوانەوە لە ڕۆژی شەممەدا (وەك جوولەکە). (٢) خاچ پەرستێکە کە ڕۆژی یەك شەممان دەحەوێتەوە.
(٣) کەسێکە کە نەریتی حەوانەوەی ڕۆژی شەممە (لای جوولەکە) یا یەك شەممە (لای خاچ پەرستان )ی بە توندوتیژی گرتبێ.
-Sabbatarianism ***(n.).***
**Sabbath** (sab′əth), ***n.*** (١) شەممە: ڕۆژی حەوانەوەو خواپەرستی‌یە لای جوولەکە؛ شەممەوانە. (٢) یەك شەممە: ڕۆژی حەوانەوەو خواپەرستی لای خاچ پەرستان. (٣) [s-]، ماوەی حەوانەوە.
***adj.*** تایبەتی بە شەممە؛ تایبەتی بە کاتی حەوانەوە.
**Sabbatical** (sə-bat′i-k'l), ***adj.*** (١) شەممەیی؛ تایبەتی بە ڕۆژی شەممە، واتە ڕۆژی حەوانەوە لای جوولەکە.
(٢) [s-]، هی ماوەی حەوانەوە: ***( a ~ leave)*** .
***n.*** **[s-], = sabbatical year.**
**sabbatical year,** (١) وەرزی پشوودان یا بە بەیار هێشتنەوەی زەوی‌وزارە هەر حەوت ساڵ جارێك لای جوولەکە لە کۆندا.
(٢)ساڵی پشوودان: ساڵێك یا شەش مانگە دەدرێت بە مامۆستای زانکۆ هەر حەوت ساڵ جارێك بۆ پشوودان‌و لێکۆڵینەوە... هتد.
(پێشی دەوترێ: " **sabbatical leave.** ").
**saber, sabre** (sā′bēr), ***n.*** (١) شمشێر.
(٢) شمشێری شمشێربازی.
***v.t.*** شمشێر لێدان؛ بە شمشێر کوشتن یا بریندارکردن.
**saber rattling,** شمشێر ڕاوەشاندن (نێو وڵاتان)؛ هەڕەشە؛ هەڕەشەلێکردن بە جەنگ.
**saber-toothed** (sā′bēr-tōōtht′), ***adj.*** *Also* **sabre-toothed,** ددان شمشێری؛ تایبەتی بە گیانداری کەڵبە درێژو چەماوەی وەك شمشێر.
**saber-toothed tiger,** پڵنگی ددان شمشێری: پڵنگێکی قڕتێکەوتووە.
**sable** (sā′b'l), ***n.*** (١) (ا) سەمموورە: گیانەوەرێکە لە توخمی دەڵەك کەوڵەکەی بەنرخە. (ب) کەوڵی سەمموورە. (٢) (ا) ڕەش؛ ڕەنگی ڕەش.
(ب) (*pl.*)، جلی ڕەش؛ بەرگی شین یا زاری.
(٣) قاوەیی تۆخ؛ ڕەنگی قاوەیی تۆخ.
***adj.*** (١) لە کەوڵی سەمموورە دروستکراوە. (٢) ڕەش؛ هی جل‌وبەرگی شین.
(٣) تاریك؛ ڕەش؛ دڵتەنگکەر.
**sabot** (sab′ō, sab′ət), ***n.*** (١) قاپ قاپ. (٢) سۆل.
**sabotage** (sab′ə-tij), ***n.*** (١) تێك‌وپێکدانی لەسەنقەست (وەك هی کەرەسەو بەرهەمی کارخانە لەلایەن کرێکاری مانگر یا بێزارەوە).
(٢) تێك‌وپێکدان‌و وێران کردن (هی وڵات لەلایەن نۆکەرانی بێگانە یا خەڵکی یاخی‌یەوە لەکاتی جەنگدا بەتایبەتی هی پردو کارخانەو هێڵی شەمەندەفەر... هتد) (٣) تێك‌وپێکدانی نهێنی پیلان یا کارێك.
(٤) کاری وێرانکەر یا تێك‌وپێکدەر.
***v.t. & v.i.*** تێك‌وپێکدان؛ وێران کردن؛ تێکدان:
***( to ~ a bridge, railroad, plan, etc.)***
**saboteur** (sab′ə-tūr′), ***n.*** [Fr.], تێك‌وپێکدەر؛ وێرانکەر (ووشەی پێشوو ببینە).
**sabra** (sabra), ***n.*** جوولەکەی لە فەلەستین یا ئیسرائیل لەدایکبوو.
**sabre** (sā′bēr), ***n.& v.t.*** **= saber.**
**sabulous** (sab′yoo-ləs), ***adj.*** *Also* **sabulose,** لماری؛ لمی.
**sac** (sak, sôk), ***n.*** توورەکە (لە گیاندارو ڕووەکدا).
**sacaton** (sak′ə-tōn′), ***n.*** گیایەکە بۆ گزرەو لەوەڕ.
**saccate** (sak′āt), ***adj.*** (١) لە توورەکە دەچێ.
(٢) توورەکەدار (ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی).
**sacchar-** (sak′ēr), **= saccharo.**
**saccharate** (sak′ə-rāt′), ***n.*** خوێی ترشی شەکر (کیمیا).
**saccharic acid,** ترشی شەکر (کیمیا).
**saccharimeter** (sak′ə-rim′ə-tēr), ***n.*** پێوەری ڕادەی شەکر لە ئاوێتەیەکدا.
**saccharin** (sak′ə-rin), ***n.*** ساکەرین: ئاوێتەیەکی بلووری‌یە چوارسەد ئەوەندەی شەکر شیرینترە (لەباتی شەکر بەکاردەهێنرێت لەلایەن ئەوانەوە کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە).
**saccharine** (sak′ə-rin, sak′ə-rīn′), ***adj.*** (١) شەکری؛ لە شەکر دەچێت؛ شەکری تێدایە. (٢) ئێجگار شیرین؛ زۆر شیرین‌و بێ تام:
***( a ~ voice, smile, etc. )***
-saccharinely ***(adv.)*** ; **saccharinity** ***(n.).***
**saccharize** (sak′ə-rīz′), ***v.t.*** کردن بە شەکر" گۆڕین بە شەکر.
**saccharo-** (sak′ə-rō, sak′ə-rə), *Also* **sacchar-,** پێشگرێکە بەمانای: شەکر.
**saccharoid** (sak′ə-roid′), ***adj.*** *Also* **saccharoidal,** لە کەللە شەکر دەچێت (بەرد)؛ کەللەشەکری؛ بلووری‌و دانار دانار.
**saccharometer** (sak′ə-rom′ə-tēr), ***n.*** پێوەری ڕادەی شەکر لە ئاوێتەیەکدا.
**saccharose** (sak′ə-rōs′), ***n.*** سوکەڕۆز: شەکری قامیشی شەکرو چەوەندەر.
**sacculate** (sak′yoo-lāt′), ***adj.*** *Also* **sacculated,** توورەکەیی؛ لە ڕیزە توورەکەی بچووك دەچێت.
**saccule** (sak′ūl), ***n.*** (١) توورەکەی بچووك.
(٢) توورەکەی گوێی ناوەوە.
**sacculus** (sak′yoo-ləs), ***n.*** **= saccule.**
**sacerdotal** (sas′ēr-dō′t'l), ***adj.*** (١) قەشەیی: تایبەتی بە قەشەو

فەرمانی (٢) تایبەتی بە دەسەلاتی قەشە وەك ناوبژیکەری نێوان خواو

**sacerdotalism** (sas´ẽr-dō′t'l-iz'm), *n.* بڕوابوون بە دەسەلاتی ئادەمیزاد قەشە وەك ناوبژیکەری نێوان خواو ئادەمیزاد.

**sachem** (sā′chəm), *n.* سەرەك خێڵی هیندی ئەمەریکی.

**sachet** (sa-shā′), *n.* توورەکەی بۆدرەی بۆندار: دەخرێتە ناو جلی هەڵگیراوەوە لەناو دۆلاب و جانتادا بۆ بۆن خۆشی.

**sack** (sak), *n.* (١) گونیە؛ توورەکە؛ جەواڵ؛ هەگبە؛ توربە؛ کیسە؛ جاخ؛ فەردە (٢) گونیە یا توورەکەو شتەکەی ناوی.
(٣) گونیەیەك شت؛ پڕ توورەکەیەك؛ پڕ فەردەیەك.
(٤) چاکەتێکی دەلبی ژنانەو منداڵانەیە.
(٥) [Slang]، لە ئیش دەرکردن: *( to get the ~ )* .
(٦) [Slang]، جێی نوستن:
*( I'm very tired, so I'm going to hit the ~ .)*
*v.t.* (١) کردنە گونیەوە؛ خستنە توورەکەوە.
(٢) [Slang]، لە ئیش یا کار دەرکردن: *( He ~ed several generals.)* .
**hit the sack,** [Slang], چوونە جێ (بۆ نوستن)؛ چوون بۆ نوستن؛ نوستن.

**sack** (sak), *n.* تالان (بەتایبەتی هی شاری داگیرکراو)؛ تالانکردن؛ ئاشبگیر.
*v.t.* تالانکردن؛ ئاشبگیرکردن؛ بڕین (ماڵ، بانق... هتد).

**sack** (sak), *n.* جۆرێکە لە مەی.

**sackbut** (sak′but′), *n.* (١) ئامێرێکی مۆسیقی کۆنە لە کەڕەنا دەچێت.
(٢) ئامێرێکی مۆسیقی ژێداری کۆنە.

**sack cloth,** (١) جانفاس؛ گوش؛ قوماشی گونیە؛ گونیە.
(٢) قوماشێکی زبرە بۆ جلی شیوەن و پەشیمانی (لە مووی بزن دروست دەکرا).

**sackful** (sak′fool´), *n.* (١) پڕ توورەکەیەك؛ پڕ گونیەیەك.
(٢) بڕێکی زۆر؛ زۆر.

**sacking** (sak′iŋ), *n.* جانفاس؛ گوش؛ قوماشی گونیە؛ گونیە

**sack race,** پێشبڕکێی ناو گونیە: (هەرکەسە دەچێتە ناو گونیەیەکەوەو بە قونەقون دەڕوات).

**sacque** (sak), *n.* چاکەتی دەلبی ژنانەو منداڵانە.

**sacral** (sā′krəl), *adj.* پیرۆز؛ تایبەتی بە نەریتی ئاینی.

**sacral** (sā′krəl), *adj.* سمتەجۆلەیی

**sacrament** (sak′rə-mənt), *n.* (١) نەریتی ئاینی پیرۆز (خاچ- پەرستی)؛ (٢) [ the S-]، شێوی خواهانە (کلێسە).
(٣) (ا) نانە ڕەقەو مەی پیرۆزکراوی ئەم شێوە. (ب) نانە ڕەقەی ئەم شێوە.
(٤) شتێکی پیرۆزو بەمانا. (٥) نیشانە. (٦) پەیمان (وەك هی مارەبڕین).

**sacramental** (sak´rə-men′t'l), *adj.* (١) هی نەریتی ئاینی پیرۆز.
(٢) پیرۆز *( a ~ duty)* .
*n.* نەریتی ئاینی پیرۆز؛ شتێکی بەکارهێنراو لە نەریتی ئاینی پیرۆزدا (وەك خاچ، ئاوی پیرۆز هتد).

**sacramentalism** (sak´rə-men′t'l-iz'm), *n.* ئەو بیروباوەڕەیە کە دەڵێت. پەیڕەوکردنی نەریتە ئاینیە پیرۆزەکان پێویستە بۆ چوونە بەهەشت.
-sacramentalist *(n.).*

**sacrarium** (sə-krâr′i-əm), *n.* (١) نزرگە؛ پەرستگا یا شوێنی دانان و هەڵگرتنی شتی پیرۆز وەك بت (ڕۆمای کۆن)
(٢) ناوچەی دەوروپشتی قوربانیگا (کلێسە).

**sacred** (sā′krid), *adj.* (١) پیرۆز
*( A mosque is a ~ building.)*
(٢) ئاینی: *( ~ music; a ~ song)* .
(٣) پیرۆز *( a ~ promise)* .
-sacredly *(adv.);* sacredness *(n.).*

**sacred College,** کۆڕی پیرۆز ئەنجومەنی کاردینالەکان (ئاینی کاسۆلیکی)

**sacred cow,** مانگا پیرۆزە کەسێك یا شتێکی لە ژوور ڕەخنەوە، واتە کە کەس نەتوانێ ڕەخنەی لێ بگرێ (لەڕووی لاقرتێ و کلك پێوەکردنەوە).

**sacrifice** (sak′rə-fīs′), *n.* (١) قوربانی:
*( He killed an ox as a ~ .)*
(٢) خۆبەختکردن: *( He gave his life as a ~ for his country.)*
(٣) لەخۆبوردن: *( Parents often make ~s.)* .
(٤) زیان (لە فرۆشتنی شتێکدا بە کەمتر لە نرخی کڕینەکەی).
*v.t.* (١) کردن بە قوربانی؛ قوربانی کردن.
(٢) بەختکردن: *( He ~d his life to save the drowning child.)* .
(٣) بە زیان فرۆشتن؛ بە کەمتر فرۆشتن لە نرخی کڕینەکەی.
*v.i.* کردن بە قوربانی؛ قوربانی کردن.
**the supreme sacrifice,** گیان بەخشین.

**sacrificial** (sak′rə-fish′əl), *adj.* هی قوربانی؛ تایبەتی بە خۆبەختکردن.
-sacrificially *(adv.).*

**sacrilege** (sak′rə-lij), *n.* (١) دزینی شتی پیرۆزو ئاینی یا بڕینی پەرستگا و پیس کردنی؛ کفر؛ کاری دژ بە ئاین:
*( Robbery of a church is a ~ .)*
(٢) بە سووك تەماشاکردن، پیس کردن، یا ڕێز نەگرتنی شتی پیرۆز: کفر (مەجاز).

**sacrilegious** (sak´ri-lē′jəs, sak´ri-lij′əs), *adj.* (١) دژ بە شتی پیرۆزو ئاینی؛ تایبەتی بە پیس کردن و ڕێزنەگرتن و بە سووك تەماشاکردنی شتی پیرۆزو ئاینی: *( a ~ act)* .
(٢) پیسکەرو ڕێزنەگری شتی پیرۆز؛ بە سووك تەماشاکەری شتی ئاینی و پیرۆز؛ کافر.
-sacrilegiously *(adv.)*; sacrilegiousness *(n.).*

**sacrist** (sā′krist), *n.*= sacristan.

**sacristan** (sak′ris-tən), *n.* (١) کلیلداری عەماری دەفری پیرۆزو جلی قەشە لە کلێسەدا. (٢) مجەوری کلێسە.

**sacristy** (sak′ris-ti), *n.* ژووری دەفرو شتی تری پیرۆزو جلی قەشە لە کلێسەدا. (هەروەها " Vestry ").

**sacro-** (sā′krō, sā′krə), پێشگرێکە بەمانای: (ا) سمتەجۆلە.
(ب) سمتەجۆلەیی

**sacroiliac** (sā´krō-il′i-ak´), *adj.* سمتەجۆلەیی؛ هی سمتەجۆلە.

**sacrosanct** (sak′rō-saŋkt´), *adj.* زۆر پیرۆز (مرۆڤ، شوێن، یاسا، دەزگا... هتد)؛ نابێ دەستکاری بکرێ، تێك بدرێت، یا سنووری بشکێنرێت
-sacrosanctity *(n.).*

**sacrum** (sā′krəm), *n.* سمتەجۆلە؛ ئێسقانی جەمسەری هەردوو سمتی گیاندار.

**sad** (sad), *adj.* (١) خەفەتبار؛ خەمبار؛ غەمگین؛ مات؛ ماتومەلوول؛ دڵتەنگ؛ پەست. (٢) دڵگیر؛ ناخۆش؛ خەفەتاوی: *( a ~ song ; ~ news)* .
(٣) ڕەنگ تاڵ؛ ڕەشتاڵە. (٤) [Slang]، زۆر خراپ.
(٥) [Dial]، قورس (شیرینی)؛ توندوتۆڵ؛ پەستراوە.

**sadden** (sad′'n), *v.t.* دڵتەنگ کردن؛ خەفەتبارکردن؛ پەستکردن.
*v.i.* دڵتەنگ بوون؛ خەفەت پێ خواردن؛ پەست بوون؛ پێ ناخۆش بوون.

**saddle** (sad′'l), *n.* (١) زین. (٢) زینی پاسکیل.
(٣) پشتی وڵاخی بەرزە. (٤) تیرەغەی نێوان دوو لووتکە.
(٥) (ا) پارچەیەك گۆشتی پشتی مەڕ (بە بڕبڕەو پەراسووەوە).
(ب) بەشی دواوەی پشتی کەڵەشێر.
*v.t.* (١) زین کردن؛ زین لێکردن
(٢) ئەرکی قورس خستنەسەر؛ باری قورس لێ نان:
*( He is ~d with ten children and heavy debts.)*
*v.i.* زین کردن؛ زین لێکردن؛ سواربوون.
**in the saddle,** جڵەو بەدەست؛ زاڵ؛ دەست ڕۆیو؛ شت بەدەست.

**saddle-bag** (sad′'l-bag´), *n.* شەڵتە؛ خورج؛ هەگبە.

**saddle-bow** (sad′'l-bō´), *n.* قەلپووزی زین؛ بەرکۆ.

**saddle-cloth** (sad′'l-klôth´), *n.* لبادی ژێر زین.

**saddle horse,** ئەسپی سواری.
**saddler** (sad′lẽr), ***n.*** زیندروو؛ زینفرۆش.
**saddlery** (sad′lẽr-i), ***n.*** (١) زیندرووێتی؛ پیشەی زیندروو.
(٢) زین‌و لغاوو ڕەشمەو زینەبەندو قایشی ئەسپ. (٣) دووکانی زیندروو.
**saddle-tree** (sad″l-trē′), ***n.*** چوارچێوەی زین.
**sadiron** (sad′ī′ẽrn), ***n.*** ئوتوی قورس.
**sadism** (sad′iz'm, sā′diz'm), ***n.*** (١) سادیێتی: خۆش بینین لە
ئازاردان‌و زەبر بەسەردا نواندن‌و دڵ سەختی کردن لەگەڵ هاوسەری خۆدا.
(٢) سادیێتی: خۆش بینین لە ئازاردان‌و دڵ سەختی نواندن لەگەڵ خەڵکدا.
**sadist** (sad′ist, sā′dist), ***n.*** سادی خۆشی بین لە ئازاردان‌و
دڵ سەختی نواندن لەگەڵ هاوسەری خۆو خەڵکدا.
**sadistic** (sa-dis′tik, sā-dis′tik), ***adj.*** سادی: تایبەتی بە سادی؛
سادییانە؛ خۆشی بین لە ئازاردانی خەڵك: ***( a ~ person, act, etc.)*** .
**-sadistically** ***(adv.).***
**sad sack** [Slang], کەسێکی نەزان‌و ناکارامە (بەتایبەتی سەربان).
**safari** (sə-fä′ri, suf′ə-rē′), ***n.*** (١) گەشت (بەتایبەتی هی ڕاو لە
ڕۆژاوای ئەفەریقا)؛ گەشتی ڕاو. (٢) ڕاوچی‌و کەرەسەی ئەم ڕاوە.
**safe** (sāf), ***adj.*** (١) بێ مەترسی؛ مەترسی لێ ناکرێ؛ بێ ترس.
(٢) سەلامەت؛ زیانی لێ نەکەوتووە؛ ئازاری نەبووە:
***( The soldiers have returned ~ from the war.)***
(٣) بێ وەی: سەلامەت؛ بێ مەترسی: ***( a ~ place)*** .
(٤) زیان نەبەخش؛ ناتوانێ زیان بگەیێنێ:
***( A murderer is only ~ when he is in prison.)***
(٥) ژیر؛ دووربین؛ وریا.
(٦) پشتی پێ ئەبەسترێ.
(٧) مسۆگەر: مەترسی (دۆڕانی) لێ ناکرێ:
***( He has a ~ seat in the parliament.)***
***n.*** (١) دۆلاب یا سنووقی ئاسن؛ دۆلابی پارەو شتومەکی بەنرخ؛ قاسە.
(٢) دۆلابێکی ساردە بۆ خواردەمەنی تێداهەڵگرتن: ***(~ a meat )*** .
(٣) سنووق. (٤) [Slang]، لاستیك (جووت بوون).
**-safely** ***(adv.)*** ; **safeness** ***(n.).***
**safe-breaker** (sāf′brā′kẽr), ***n.*** دۆلابی ئاسنبڕ؛
دۆلابی ئاسنشکێن (بۆ دزی).
**safe-conduct** (sāf′kon′dukt), ***n.*** (١) ڕێ پێدانی تێپەڕبوونی
بێ مەترسی (بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا).
(٢) بەڵگەی نووسراوی ئەم ڕێ پێدانە.
(٣) پاس کردن‌و پاسەوانی کردنی ئەم تێپەڕبوونە.
***v.t.*** (١) ڕێ پێدان بە تێپەڕبوون بە سەلامەتی (بە ناوچەی دوژمندا).
(٢) پاراستن لەکاتی ئەم تێپەڕبوونەدا.
**safe-cracker** (sāf′krak′ẽr), ***n.*** = **safe-breaker.**
**safe-deposit box,** سنووقی سپاردەی ئەمین (بۆ پارەو خشڵ‌و
شتومەکی بەنرخ دانان لە بانق یا شوێنێکی قایم‌و بێ ترسدا).
**safeguard** (sāf′gärd′), ***n.*** (١) مەرجێکی پارێزەر یا دڵنیاکەر لە
قۆنتەرات یا پەیمانێکدا. (٢) پارێزەر (شت، مرۆڤ)؛ پارێز:
***( Clean food is a ~ against disease.)***
(٣) ڕێ پێدانی تێپەڕبوون بەبێ مەترسی.
(٤) پاسەوان(قافلە).
(٥) ئامێری دڵنیایی دژ بە ڕووداوی کوتوپڕی مەکینەیەك؛ زمانەی دڵنیایی.
***v.t.*** پاراستن: مسۆگەرکردن؛ پاس کردن:
***( to ~ a place, an achievement, etc.)***
**safe-keeping** (sāf′kēp′iŋ), ***n.*** پاراستن؛ پاس کردن.
**safety** (sāf′ti), ***n.*** (١) سەلامەتی؛ ئاسوودەیی؛ بێ وەیی؛ پارێزگاری؛
بێ مەترسی. (٢) ئامێر یا زمانەی دڵنیایی دژی ڕووداوی کوتوپڕی مەکینەیەك.
(٣) [Slang]. لاستیك (جووت بوون).
***adj.*** پارێز: پارێزەر؛ هی پاراستن؛ هی پارێزگاری: ***( ~ measures)*** .

**safety belt,** پشتێنی سەلامەتی (لە ئوتومبیل‌و فڕۆکەدا).
(پێشی دەوترێ " **seat belt** ").
**safety glass,** شووشەی بێ زیان (کە ووردو خاش نابێ‌و بۆ جامی
ئوتومبیل... هتد بەکاردەهێنرێت).
**safety island,** ناوچەیەکە لەسەر شەقامدا قەدەغەیە بۆ ئوتومبیل‌و بۆ
پیادە دانراوە. (پێشی دەوترێ: " **safety zone** ").
**safety lamp,** (١) چرای سەلامەتی (لە کانگەدا). (٢) فانۆس؛ لۆکس.
**safety lock,** (١) قفڵی سەلامەتی: قفڵێکە کە هەر بە کلیلەکەی خۆی
دەکرێتەوەو نابڕێ. (٢) قفڵی سەلامەتی چەکی ئاگرین.
**safety match,** شقارتەی بێ زیان.
**safety pin,** دەرزی سنجاق.
**safety razor,** گوێزانی بێ زیان (ڕیش تاشین).
**safety valve,** (١) زمانەی دڵنیایی یا سەلامەتی (مەنجەڵی هەلم.... هتد).
(٢) کەلێن (بۆ دەرچواندنی هەست‌و جۆشی زیادە)؛ دەرەتان؛ هۆی دەربڕین.
**safety zone,** – **safety island.**
**safflower** (saf′lou′ẽr), ***n.*** ڕۆنی گولەبەڕۆژە.
**saffron** (saf′rən), ***n.*** (١) زەعفەران. (٢) ڕووەکی زەعفەران.
(٣) زەردی پرتەقاڵی؛ ڕەنگی زەعفەران.
**safranin** (saf′rə-nin), ***n.*** = **safranine.**
**safranine** (saf′rə-nēn′), ***n.*** سافرانین: ماددەیەکی سووری مەیلەو
پرتەقاڵییە ڕەنگی پێ دەکرێت.
**sag** (sag), ***v.i.*** (١) ئەوین؛ داکەوتن؛ داتەپین:
***( The ceiling has ~ged.)***
(٢) شۆڕبوونەوە؛ داکەوتن.
(٣) لاوازبوون؛ هێز لێ بڕان؛ داتەپین؛ داکەوتن؛ خاوبوونەوە:
***( His energies has ~ged.)***
(٤) شکان (نرخ، بازاڕ).
(٥) لە ڕێ لادان (کەشتی).
***v.t.*** ئەواندن؛ داتەپاندن.
***n.*** (١) ئەوین؛ داکەوتن؛ داتەپین. (٢) ڕادەی ئەوین یا داکەوتن.
(٣) شوێنی ئەویو یا داتەپیو.
(٤) لە ڕێ لادان.
**saga** (sä′gə), ***n.*** (١) داستانی شەڕوشۆڕی ئەسکەندنیاڤی.
(٢) داستانی شەڕوشۆڕ؛ چیرۆکی ئازایی؛ چیرۆکی دووروودرێژ.
**sagacious** (sə-gā′shəs), ***adj.*** (١) دانا؛ زیرەك؛ زرنگ؛ ژیر؛ زانا؛
دووربین. (٢) [Archaic]، بۆن تیژ.
**sagacity** (sə-gas′ə-ti), ***n.*** دانایی؛ زیرەکی؛ زرنگی؛ ژیرێتی؛ زانایی؛
دووربینی
**sagamore** (sag′ə-môr′, sag′ə-mōr′), ***n.*** سەرەك تیرەیەکی
خواردەستی هیندی ئەمەریکی.
**saga novel,** چیرۆکی پشتاوپشتی خێزانێك.
**sage** (sāj), ***adj.*** (١) دانا؛ ژیر؛ دووربین؛ زانا.
(٢) دانایانە؛ ژیرانە؛ دووربینانە: ***( a ~ comment)*** .
(٣) [Obs.]، گرنگ.
***n.*** کەسێکی دانا یا ژیر (بەتایبەتی کەسێکی بەتەمەنداچوو).
**sage** (sāj), ***n.*** ڕووەکێکە لە توخمی جاترە (دەکرێتە چێشتەوە).
**sage grouse,** باڵندەیەکی کێوییە لە مریشك دەچێت بەڵام گەورەترە.
(مێیەکەی پێی دەوترێ: " **sage hen** ").
**sagittal** (saj′i-t'l), ***adj.*** (١) تیری؛ تیر ئاسا؛ لە تیر دەچێت.
(٢) تایبەتی بە هێڵی لێکدانی ئێسقانی کاسەی سەر.
**Sagittarius** (saj′i-târ′i-əs), ***n.*** (١) کۆئەستێرەی تیرو
تیرهاوێژ
(ئەستێرەوانی). (٢) بورجی تیرو تیرهاوێژ ( ئەستێرەوانی)
**sagittate** (saj′i-tāt′), ***adj.*** تیری؛ تیرئاسا؛ لەتیر دەچێت:
***( ~ leaves)***

**sagittiform** (sə-jit′ə-fôrm´, saj′i-tə-fôrm´), ***adj.*** = **sagittate.**

**sago** (sā′gō), ***n.*** نیشاستەیەکی تۆزە لە کرۆکی قەدی هەندێ دارخورما دەردەهێنرێت.

**sago palm,** دارخورمای " ساگۆ ": لە ناوچە گەرمەکانی ئاسیادا دەڕوێت.

**saguaro** (sə-gwä′rō, sə-wä′rō), ***n.*** جۆرێکە لە " کاکتەس " (هەنجیری دڕکاوی) بە ئاسماندا هەڵدەچێت، بەرێکی زەرد دەگرێت لە ئەریزۆنا لە ڕۆژاوای ئەمەریکادا دەڕوێت

**said** (sed), *past tense and past participle of* **say.**

***adj.*** ناوبراو؛ لەوەوپێش ناوبراو

**sail** (sāl), ***n.*** (١) بایەوان. (٢) بایەوان بەگشتی.
(٣) کەشتی با؛ بەلەمی با؛ کەشتی بایەوان. (٤) گەشتی بەلەم یا کەشتی.
(٥) شتێکی لە بایەوان چوو (وەك پەروانەی ئاشەبا).

***v.i.*** (١) بە ئاودا ڕۆیشتن بەهۆی بایەوانەوە (کەشتی، ڕێبوار).
(٢) دەست بە گەشت کردن بە کەشتی با. (٣) ڕاندن بە بایەوان یا پەروانە.
(٤) فڕین بەبێ خشپە. (٥) بەجوانی و لەنجەولار ڕۆیشتن.
(٦) [Colloq.]. خێرا تێپەڕبوون.
(٧) [Colloq.]. ( ~ in )، دەست بە کارکردن بە چالاکانە.

***v.t.*** (١) بە ئاودا ڕۆیشتن؛ گەشتی ئاوی کردن. (٢) کەشتی یا بەلەم ڕاندن.

**in sail,** بایەوانەکانی کراونەتەوە، واتە کەشتییەکە یا بەلەمەکە لە ڕۆیشتندایە

**make sail,** (١) کردنەوەی بایەوان. (٢) دەستکردن بە گەشتی ئاوی.

**sail against the wind,** (١) دژی با ڕۆیشتن (کەشتی)؛ بەرەو با چوون.
(٢) لە بارێکی دژواردا کارکردن؛ ناخۆشی و گیروگرفت بۆ خۆ دروستکردن.

**sail into,** [Colloq.], (١) بە چالاکانە دەستپێکردن (ئیش وکار).
(٢) بە توندوتیژی سەرزەنشتکردن؛ هێرشی خراپ بردنە سەر.

**set sail,** (١) بایەوان کردنەوەو ئامادەکردن بۆ گەشت.
(٢) دەست بە گەشت کردن؛ کەوتنەڕێ.

**take in sail,** بایەوان شۆڕکردنەوە یا هەڵکردن.

**under sail,** لە ڕۆیشتندایە (کەشتی و بەلەمی با)؛ بایەوانەکانی کراونەتەوەو بەرزکراونەتەوە.

**sailboat** (sāl′bōt´), ***n.*** بەلەمی با؛ کەشتی با.

**sail-cloth** (sāl′klôth´, sāl′kloth´), ***n.*** قوماشی بایەوان

**sailer** (sāl′ẽr), ***n.*** بەلەمی با؛ کەشتی با؛ کەشتی بایەوان:
***( a swift ~ )***

**sail-fish** (sāl′fish´), ***n.*** جۆرە ماسییەکی دەریایی گەورەیە.

**sailing** (sāl′iŋ), ***n.*** (١) کەشتی ڕانی؛ شێوەو خێرایی کەشتی ڕانی.
(٢) دەست بە گەشتی دەریایی کردن

***adj.*** (١) بە با لێخوڕراو؛ هی بایەوانی.
(٢) هی کەشتی ڕانی: ***( ~ orders)*** .

**sailor** (sāl′ẽr), ***n.*** (١) کەشتییەوان؛ دەریاوان؛ زەریاوان.
(٢) سەربازی هێزی دەریایی. (٣) ڕێبواری دەریا بەتایبەتی لەڕووی تووش بوون یا تووش نەبوونی گێژی دەریاوە. (٤) جۆرێکە لە کڵاوی پووش.

***adj.*** کەشتییەوانی؛ وەك هی کەشتیوان.

-sailorly ***(adv.).***

**sailor's-choice** (sāl′ẽrz-chois´), ***n.*** هەڵبژاردەی کەشتییەوان: جۆرێکە لە ماسی

**sain** (sān), ***v.t.*** (١) نیشانەی خاچ بەسەردا لێدان. (٢) دۆعا بۆ کردن.

**sainfoin** (sān′foin), ***n.*** ڕووەکێکە بۆ ئالف بەکاردێت.

**saint** (sānt), ***n.*** (١) پیاوچاك (ئاین)؛ کەسێکی پیرۆز؛ پیر (ئاین).
(٢) کەسێکی پیرۆزی مردووە کە خاچ پەرستان دایان ئابێ بە " پیاوچاك ".

***adj.*** پیرۆز

***v.t.*** بە " پیاوچاك " دانان (خاچ پەرستی).

**sainted** (sān′tid), ***adj.*** (١) بۆ پیاوچاك دەشێت (٢) پیرۆز.
(٣) بە پیاوچاك دانراو.

**sainthood** (sānt′hood´), ***n.*** (١) پیاوچاکێتی (ئاین)؛ پلەوپایەی " پیاوچاك"؛ پیری (ئاین). (٢) پیاوچاکان بەگشتی.

**saintliness** (sān′li-nis), ***n.*** پیاوچاکێتی (ئاین)؛ پاکی و پیرۆزی.

**saintly** (sānt′li), ***adj.*** پیاوچاکانە؛ بۆ پیاوچاك شیاو؛ پاك و پیرۆزە.

**saintship** (sānt′ship), ***n.*** = **sainthood.**

**saith** (seth), *archaic third person singular, present indicative of* **say.**

**sake** (sāk), ***n.*** (١) لەپێناو؛ لەبەر؛ بۆ:
***( for the ~ of money, peace, humanity, his family, etc.)***
(٢) لەبەر؛ لەبەرخاتری؛ سوود: ***( for your ~ )*** .

**sake** (sä′ki), ***n.*** ساکی: خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری یابانییە لە عەرەق دەچێت.

**saker** (sā′kẽr), ***n.*** هەلۆ.

**salaam** (sə-läm′), ***n.*** سەلام؛ سڵاو.

***v.t. & v.i.*** سڵاولێکردن.

**salability; saleability** (sāl´ə-bil′ə-ti), ***n.*** فرۆخت؛ برەو؛ بازاڕ هەبوون.

**salable; saleable** (sāl′ə-b'l), ***adj.*** بەفرۆشرێت؛ بە فرۆخت؛ دەتوانرێ بفرۆشرێت.

**salacious** (sə-lā′shəs), ***adj.*** (١) بەئالۆش (جووت بوون)؛ حەشەری؛ بەهەوەس. (٢) بێ شەرم؛ هەڵماڵراو؛ ڕووت؛ هەوەس هەڵسێن؛ بێ پەردە:
***( a ~ book, novel, poem, picture, etc.)***

-salaciously ***(adv.)***; **salaciousness *(n.).***

**salacity** (sə-las′ə-ti), ***n.*** (١) بەئالۆشی؛ حەشەرێتی.
(٢) هەڵماڵراوی؛ بێ پەردەیی؛ بێ شەرمی.

**salad** (sal′əd), ***n.*** زەڵاتە.

**salad days,** کاتی گەنجی و ساویلکەیی و بەرەڵایی.

**salad dressing,** خۆشاوی زەڵاتە؛ ترش و خوێ و سرکاوی زەڵاتە.

**salamander** (sal′ə-man´dẽr), ***n.*** (١) مارمێلکەیەکی ئەفسانەییە (کە گوایە توانیویێتی لەناو ئاگردا بژی). (٢) گیانێکی لە ئاگردا ژیاو (ئەفسانە)
(٣) کەسێکە کە زۆر حەز لە گەرما دەکات؛ گەرماخواز.
(٤) دەفرێکە بەرگەی ئاگر بگرێ (مقاش، دەفری چێشت لێنانی ناو تەنوور).
(٥) قوڕناویلکە؛ مارمێلکە.

**salami** (sə-lä′mi), ***n.*** سەلامی: گۆشتی بەهارات پێوەکراوی توێ توێی بەرازە.

**sal-ammoniac,** کلۆریدی ئەمۆنیا (کیمیا)؛ کلۆریدی نەوشادر.

**salaried** (sal′ə-rid), ***adj.*** (١) مووچەخۆر: ***( a ~ person)*** .
(٢) بەمووچە؛ بەمووچەوە: ***( a ~ position)***

**salary** (sal′ə-ri), ***n.*** مووچە؛ مانگانە.

**sale** (sāl), ***n.*** (١) فرۆشتن. (٢) فرۆخت؛ برەو؛ بازاڕبوون یا نەبوون.
(٣) هەڕاج.
(٤) نرخ داشکان؛ نرخ داشکاوی: ***( The shirts are on ~ .)*** .

for ( or on ) **sale,** بۆ فرۆشتن:
***( Is this house for sale? )***

**saleability** (sāl´ə-bil′ə-ti), ***n.*** = **salability.**

**saleable** (sāl′ə-b'l), ***adj.*** = **salable.**

**sales-clerk** (sālz′klũrk´), ***n.*** فرۆشیار (پیاو یا ژن).

**sales-girl** (sālz′gũrl´), ***n.*** = **saleslady.**

**sales-lady** (sālz′lā´di), ***n.*** [Colloq.], فرۆشیاری ژن؛ ئافرەتی فرۆشیار.

**salesman** (sālz′mən), ***n.*** فرۆشیار.

**salesmanship** (sālz′mən-ship´), ***n.*** (١) فرۆشیاری؛ پیشەی فرۆشیار. (٢) لێهاتوویی فرۆشیاری.

**salesperson** (sālz′pũr´s'n), ***n.*** فرۆشیار (پیاو یا ژن).

**sales-room** (sālz′rōōm´, sālz′room´), ***n.*** فرۆشگا.

**sales-talk,** (١) هاندان و پێ سەلماندنی کەسێك بۆ کڕین.
(٢) وتوویژێکە بۆ هاندانی کەسێك بۆ کردنی شتێك.
**sales tax,** باجی فرۆشتنی
**saleswoman** (sālz′woom′ən), ***n.*** = saleslady.
**salic law,** یاسای سالی (کە تیرەیەکی فەرەنگی کۆنن): (ا) ماف نەدان بە ئافرەت بۆ میراتی زەوی‌وزار بردن.
(ب) ماف نەدان بە ئافرەت بۆ چوونە سەر تەختی پاشایی.
**salience** (sā′li-əns, sāl′yəns), ***n. Also* saliency,** (١) (ا) بازد؛ قونە. (ب) فیچقە. (٢) دەرپەڕین؛ شتی دەرپەڕیو؛ چوقلە؛ نووکە؛ لووتکە؛ دەرپەڕین. (٣) ئاشکرایی؛ لەبەرچاوی؛ زۆر دیاربوون.
**salient** (sā′li-ənt, sāl′yənt), ***adj.*** (١) (ا) بازدەر؛ قونەکەر؛ هەڵتووزین. (ب) فیچقەکەر. (٢) دەرپەڕیو؛ دەرپەڕیو (گۆشە).
(٣) دیار؛ لەبەرچاو؛ ئاشکرا؛ لەپێش.
***n.*** (١) سەری دەرپەڕیوی سەنگەر. (٢) گۆشەی دەرپەڕیو؛ بەشی دەرپەڕیو.
**salientian** (sā′li-en′shi-ən, sā′li-en′shən), ***adj.*** تایبەتی بە گیانداری تەرووشکی قونەکەر؛ قونەکەر.
***n.*** گیانداری قونەکەر (وەك بۆق).
**saliferous** (sə-lif′ēr-əs), ***adj.*** خوێی تێدایە؛ خوێی لێ دەردەهێنرێت.
**salify** (sal′ə-fī′), ***v.t.*** (١) سوێرکردن؛ خوێ تێکردن.
(٢) گۆڕین بۆ خوێ؛ کردن بە خوێ.
**salina** (sə-lī′nə), ***n.*** (١) ئەستێڵی خوێیاوی؛ گۆم یا زەلکاوی خوێیاوی. (٢) کانەخوێ؛ شوێنی خوێ دروستکردن (بە کوڵاندنی ئاوەکە).
**saline** (sā′līn), ***adj.*** (١) خوێیاوی؛ سوێر؛ خوێدار.
(٢) هی خوێی کانزایی (کیمیا).
***n.*** (١) گۆم یا ئەستێڵی خوێیاوی؛ کانەخوێ. (٢) خوێی کانزایی.
(٣) گیراوەی سوێر (پزیشکەوانی).
**salinity** (sə-lin′ə-ti), ***n.*** سوێری؛ خوێیاویتی.
**salinometer** (sal′i-nom′ə-tēr), ***n.*** پێوەری پلەی خوێ لە گیراوەیەکدا.
**saliva** (sə-lī′və), ***n.*** لیك؛ لیکاو؛ ئاوی دەم.
**salivary** (sal′ə-ver′i), ***adj.*** لیکی؛ لیکاوی؛ تایبەتی بە لیك.
**salivate** (sal′ə-vāt′), ***v.t.*** لیکی زۆر پێ دەردان.
***v.i.*** لیك دەردان؛ ئاوتێزانە دەم.
**-salivation** ***(n.)*** ; **salivator** ***(n.).***
**sallet** (sal′it), ***n.*** جۆرە کڵاوزرێیەکە لەسەدەی پانزەدا لەسەردەکرا
**sallow** (sal′ō), ***adj.*** ڕەنگ زەرد؛ ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاو.
***v.t.*** ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاندن.
**sallow** (sal′ō), ***n.*** (١) شۆڕەبی. (٢) شووڵ یا باریکە لقی شۆڕەبی.
**sally** (sal′i), ***n.*** (١) هێرش (لەلایەن هێزی ئابلووقەدراوەوە)؛ پەلامار.
(٢) هەڵمەت؛ هەڵپە؛ لەپڕ دەرپەڕین.
(٣) قسەی قوت؛ نوکتە؛ قسەی نەنتیکە یا قۆشمە. (٤) گەشت.
***v.i.*** (١) لەپڕ دەرپەڕینە دەرەوە.
(٢) هێرش بردنە سەر دوژمن (لەلایەن هێزی ئابلووقەدراوەوە)؛ پەلاماردان.
(٣) لە دەرگا یا کون هاتنەدەرەوە
(٤) ( ~ forth ; ~ out )، دەست بە گەشت کردن؛ کەوتنەڕێ.
**salmagundi; salmagundy** (sal′mə-gun′di), ***n.*** (١) جۆرە زەڵاتەیەکە لە تیلماسکە گۆشت و هێلکەی کوڵاو و پیاز و ماسی بچووك دروست دەکرێت. (٢) شتی تێکەڵ؛ شتی هەرەمە.
**salmi; salmis** (sal′mi), ***n.*** گۆشتی باڵندەی کێوی بە بەهارات و مەی لێنراو
**salmon** (sam′ən), ***n.*** (١) سەلموون: جۆرە ماسییەکی سوورە؛ ماسییە خاتوونە. (٢) ڕەنگی سووری پرتەقاڵی.
**salmonberry** (sam′ən-ber′i), ***n.*** (١) ڕووەکێکە لە تووترك دەچێت. (٢) بەری لە تووترك چووی ئەم ڕووەکە.
**salmonoid** (sal′mə-noid′), ***adj.*** (١) سەلموونی؛ لە ماسی سەلموون دەچێت. (٢) لە توخمی سەلموونە.
***n.*** ماسییەکە لە توخمی سەلموون.
**salmon pink,** پەمەیی سەلموونی؛ سووری پرتەقاڵی.
**salon** (sə-lon′), ***n.*** (١) سالۆن؛ دیوەخان؛ سالۆنی حەوانەوە یا چاوەڕێ کردن. (٢) کۆڕی دیوەخان (بەتایبەتی هی هونەرمەند و بوێژ و نووسەران لە دیوەخانی یەکێکیاندا). (٣) پیشانگای تابلۆ.
(٤) خانە (وەك: سەرتاشخانە)؛ سالۆن: ( ***a beauty ~*** ).
**saloon** (sə-lōōn′), ***n.*** (١) سالۆن؛ دیوەخان؛ سالۆنی حەوانەوە یا چاوەڕێ کردن. (٢) مەیخانە؛ بار. (٣) [British]، ئۆتۆمبێلی سالۆن؛ قەمەرە.
**saloon-keeper** (sə-lōōn′kēp′ēr), ***n.*** مەیخانەچی.
**salpingitis** (sal′pin-jī′tis), ***n.*** هەوکردنی بۆری " فالووبی " و " ئۆستاکی "، واتە هی گوێ.
**salpinx** (sal′piŋks), ***n.*** (١) بۆری فالووبی.
(٢) بۆری ئۆستاکی، واتە هی گوێ.
**salsify** (sal′sə-fī′), ***n.*** ڕووەکی گونچکەماسی: ڕووەکێکە ڕەگەکەی گۆشتن و سپی و درێژە دەخورێت.
**sal soda,** کاربۆناتی سۆدیۆم (کیمیا).
**salt** (sôlt), ***n.*** (١) خوێ؛ نمەك. (٢) تام؛ تام و بۆی تیژ.
(٣) قسەی قوت و نەنتیکە و تیژ؛ گاڵتەی بڕ؛ قسەی سوێر.
(٤) پارێزەر؛ پاککەرەوە. (٥) خوێدان.
(٦) [Colloq.]، کەشتیەوانی قاڵ.
***adj.*** (١) خوێیاوی؛ خوێدار. (٢) خوێ کراو؛ بە خوێ پارێزراو.
(٣) سوێر. (٤) تیژ؛ بڕ؛ قوت (قسە).
***v.t.*** (١) خوێ پێوەکردن؛ خوێ تێکردن.
(٢) سوێرکردن؛ خوێ کردن بۆ پاراستن (وەك قاوورمە).
(٣) بەهارات پێوەکردن (مەجاز):
***( He ~ed his conversation with wit.)***
**not worth one's salt,** بێ فەڕ؛ بێ بایەخ؛ هیچ و پووچ.
**salt away ( or down ),** (١) سوێرکردن و هەڵگرتن.
(٢) [Colloq.]، پاشەکەوت کردن؛ هەڵگرتن (پارە).
**salt of the earth,** باشترین کەس یا خەڵك؛ نموونەی باشی و دڵپاکی و پیاوەتی:
***( Those people are the salt of the earth.)***
**with a grain of salt,** بڕوا زۆر پێ نەکردن؛ گومان لێ بوون؛ بەگومانەوە:
***( You have to take what he says with a grain of salt.)***
**worth one's salt,** بە بایەخ؛ کارامە؛ جێی بڕوایە.
**saltant** (sal′tənt), ***adj.*** سەماکەر؛ هەڵپەڕکێکەر؛ بازدەر.
**saltarello** (sal′tə-rel′ō), ***n.*** (١) سەمایەکی بەجۆشی ئیتاڵیە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**saltation** (sal-tā′shən), ***n.*** (١) سەما؛ بازد؛ قونە.
(٢) گۆڕینێکی کوتوپڕی. (٣) پل دان (دەماری خوێن).
(٤) گۆڕینێکی بنچینەیی (گیاندار یا ڕووەك).
**saltatorial** (sal′tə-tôr′i-əl, sal′tə-tō′ri-əl), ***adj.*** (١) تایبەتی بە قونەکردن یا بازدان. (٢) قونەکەر؛ بازدەر.
**saltatory** (sal′tə-tôr′i, sal′tə-tō′ri), ***adj.*** (١) قونەکەر؛ بازدەر.
(٢) زوو زوو دەگۆڕێ.
**salt-cellar** (sôlt′sel′ēr), ***n.*** خوێدان.
**salted** (sôl′tid), ***adj.*** (١) سوێرکراو؛ خوێ کراو (بۆ هەڵگرتن وەك قاوورمە). (٢) [Colloq.]، قاڵ؛ کارامە؛ شارەزا؛ سەردەرچوو.
**salter** (sôl′tēr), ***n.*** (١) خوێ فرۆش؛ خوێ دروستکەر.
(٢) گۆشت و ماسی سوێرکەر.
**saltern** (sôl′tērn), ***n.*** = saltworks.
**saltigrade** (sal′ti-grād′), ***adj.*** لاقی بۆ قونەکراوە؛ قونەکەر.
**saltiness** (sôl′ti-nis), ***n.*** سوێری.

**saltish** (sôl′tish), *adj.* نەختێك سوێر.

**salt lick,** بەردە خوێیەکە کە گیاندار دەیلێسنەوە.

**salt marsh,** زەلکاوی خوێیاوی

**saltpeter ; saltpetre** (sôlt′pē′tēr), *n.* بەردەخوێ؛ نەتراتی پۆتاسیۆم و سۆدیۆم.

**salt rheum,** نەخۆشی پێست (بەتایبەتی بیرۆ).

**salt shaker,** خوێدان

**salt-water** (sôlt′wô′tēr, sôlt′wät′ēr), *adj.* هی ئاوی سوێر؛ لە ئاوی سوێردا ژیاو: ***( ~ fish)*** .

**salt water,** سوێراو؛ ئاوی دەریا.

**saltworks** (sôlt′wūrks′), *n.* کارگەی خوێ؛ شوێنی خوێ دروستکردن (لە ڕێی کولاندنی خوێ ئاوەکەوە).

**salt-wort** (sôlt′wūrt′), *n.* ئەسپوون: جۆرە گیایەکە سابوونی لێ دروست دەکرێ.

**salty** (sôlt′ti), *adj.* (١) سوێر؛ زۆرخوێ (٢) بۆنی دەریای لێ دێت (٣) قوت (قسە)؛ تیژ؛ بڕندە.

**salubrious** (sə-lōō′bri-əs, sə-lū′bri-əs), *adj.* سازگار

**-salubriousness** ***(n.).***

**salubrity** (sə-lōō′brə-ti, sə-lū′brə-ti), *n.* سازگاری؛ بۆ تەندروستی باش بوون.

**saluki** (sə-lōō′ki), *n.* سەلووتی. تانجی؛ جۆرێکە لە سەگی ڕاو.

**salutary** (sal′yoo-ter′i), *adj.* (١) سازگار؛ بۆ تەندروستی باشە. (٢) باش؛ بەسوود؛ بەکەڵك: ***( a ~ effect)*** .

**-salutariness** ***(n.).***

**salutation** (sal′yoo-tā′shən), *n.* (١) سلاو؛ سلاولێکردن؛ بەخێرهاتن کردن؛ درووود. (٢) سلاوی سەرەتای نامە (وەك: **Dear Sir,** ).

**salutatorian** (sə-lōō′tə-tôr′i-ən), *n.* قوتابی بەخێرهاتنکەر؛ وتاری بەخێرهاتن خوێنەرەوە؛ قووتابییەکە وتاری بەخێرهاتن دەخوێنێتەوە لە ئاهەنگی دەرچووندا. (بەگشتی قوتابی دووەم ئەم وتارە دەخوێنێتەوە. وشەی " **valedictorian** " ببینە).

**salutatory** (sə-lōō′tə-tôr′i), *adj.* بەخێرهاتنی.

***n.*** وتاری بەخێرهاتن: کە ئەو قوتابییەی بە دووەم دەرچووە دەیخوێنێتەوە لە ئاهەنگی دەرچوونی زانکۆ و زانستگادا.

**salute** (sə-lōōt′, sə-lūt′), *v.t.* (١) سلاولێکردن؛ بەخێرهاتن کردن. (٢) سەلام بۆ کردن (سەربازی)؛ سەلام کردن؛ سەلام سەندنەوە. (٣) شکۆپێدان؛ ڕێزگرتن؛ ئافەرین کردن (٤) بەپیرەوەچوون؛ خۆ پێشکەش کردن

***v.i.*** (١) سلاوکردن؛ بەخێرهاتن کردن (٢) سەلام کردن (سەربازی).

***n.*** (١) سلاو؛ بەخێرهاتن؛ درووود (٢) سەلام (سەربازی). (٣) تەقەی تۆپ (بۆ بەخێرهاتن کردنی ڕەسمی) (٤) بەیداخ نەواندن (بۆ ڕێز پیشاندان).

**salvable** (sal′və-b'l), *adj.* (١) ڕزگار دەکرێ؛ دەتوانرێ ڕزگار بکرێ. (٢) ڕزگار دەکرێ لە فەوتاندن؛ دەرباز دەکرێت.

**salvage** (sal′vij), *n.* (١) ڕزگارکردنی کەشتی و بارەکەی و کەشتییەوانەکانی لە مەترسی وەك ئاگر و نوقم بوون و داگیرکردن. (٢) مز یا کرێی ئەم ڕزگارکردنە. (٣) کەشتی و بار و کەشتییەوانی ڕزگارکراو (٤) هێنانە سەرەوە یا دەرهێنانی کەشتی نوقوم بوو. (٥) (أ) دەربازکردنی شتومەك لە ماڵ و شوێنی تری سووتاودا. (ب) شتومەکی دەربازکراوی وەها. (ج) مز یا کرێی ئەم دەربازکردنە. (د) دەسکەوتی فرۆشتنی ئەم شتومەکە (٦) بەکارهێنانی شتومەکی دەربازکراو لە فەوتاندن.

***v.t.*** (١) ڕزگارکردن (لە فەوتاندن، نوقوم بوون یا وەرگەڕانی کەشتی، ئاگر، لافاو، بوومەلەرزە ...هتد). (٢) هێنانە سەرەوە یا دەرهێنانی کەشتی نوقوم بووو وەرگەڕاو. (٣) بەکارهێنانی شتی دەربازکراو (لە ئاگر و لافاو و شتی وەها)

**-salvageable** ***(adj.)*** **; salvager** ***(n.).***

**salvation** (sal-vā′shən), *n.* (١) ڕزگارکردن؛ ڕزگاربوون؛ ڕزگاری. (٢) هۆی ڕزگاری؛ هۆی ڕزگارکردن: ***( Hard work is his ~ .)*** . (٣) ڕزگارکردن یا ڕزگاربوون لە گوناه (ئاین)؛ گوناه پاك کردنەوە؛ گوناه لەسەر لابردن.

**Salvation Army,** لەشکری ڕزگاری: ڕێکخراوێکە بۆ یارمەتیدانی هەژاران و ئاین بلاوکردنەوە.

**salve** (sav, säv), *n.* (١) مەلحەم. (٢) دەرمانی خەم ڕەوێن؛ خەم ڕەوێن؛ دڵنەوایی: ***( Her kind words were a ~ for his sunken heart.)*** (٣) مەرایی.

***v.t.*** (١) مەلحەم لێدان. (٢) خەم ڕەواندنەوە؛ دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنەوایی کردن. (٣) مەرایی.

**salve** (salv), *v.t.* = **salvage.**

**salver** (sal′vēr), *n.* سینی؛ دەفری پەل.

**salvia** (sal′vi-ə), *n.* گوڵە مریەمی: ڕووەکێکی بۆن خۆشە لە توخمی نەعنا.

**salvo** (sal′vō), *n.* (١) دەسرێژ؛ هاڕەی گوللە. (٢) گوللە یا مووشەکی یەك لەدوای یەك تەقێنراو. (٣) هاڕەی چەپڵە یا قاقای پێکەنین. (٤) کۆمەڵ یا ڕیزە پرسیار

**salvo,** خۆبەدەستەوەنەدان؛ بیانوو؛ ڕاکردن لە ئەرك؛ خۆدزینەوە؛ دوودڵی.

**salvor** (sal′vēr), *n. Also* **salver,** کەشتی یا مرۆڤی ڕزگارکەر (لە نوقوم بوون، سووتان، لافاو...هتد).

**samara** (sam′ə-rə, sə-mâr′ə), *n.* بەرێکی وشکی یەك دەنکییە توێکڵەکەی لە شێوەی باڵدایە وەك بەری دارەڕەش.

**samaritan** (sə-mar′ə-t'n), *n.* (١) سامری: هاونیشتمانییەکی " سامرە " لە فەلەستین (٢) کەسێکی دڵپاکە کە هەمیشە یارمەتی خەڵك دەدات.

***adj.*** تایبەتی بە " سامرە " و دانیشتووانەکانی.

**samarskite** (sə-mär′skīt), *n.* سەمەرسکایت: کانزایەکی بریقەداری ڕەشە ئاسن و یورانیۆم و هەندێ کانزای تری تێدایە.

**samba** (sam′bə, säm′bə), *n.* سەمایەکی بەرازیلییە لە بنچینەدا ئەفەریقاییە.

***v.i.*** سەمای " سامبە " کردن.

**sambar** (sam′bēr, säm′bēr), *n.* جۆرە ئاسکێکی زلی یالداری شاخ سێپەلە.

**sambo** (sam′bō), *n.* سامبۆ: کەسێکی دووڕەگ بەتایبەتی هی قولەڕەش و هیندی ئەمەریکایی یا قولەڕەش و ئەورووپایی.

**same** (sām), *adj.* (١) هەمان؛ یەك (کات، شوێن): ***( They died on the ~ day.)*** (٢) چوونیەك؛ هاو؛ وەك یەك: ***( He eats the ~ food every day.)*** . (٣) نەگۆڕاو؛ وەك جاران: ***( He looks the ~ as ever.)*** . (٤) ناوبراو؛ پێشووتر ناوبراو.

***pron.*** **( the ~ ),** (١) هەمان کەس، شت، یا ڕووداو. (٢) کەسێکی زووتر ناوبراو.

***adv.*** **( the ~ ),** هەمان شێوە؛ هەمان جۆر: ***( He walks the ~ as his father.)***

**all the same,** (١) لەگەڵ ئەوەشدا. (٢) بێ بایەخ؛ ناگرنگ؛ هیچ.

**just the same,** (١) بە هەمان شێوە. (٢) لەگەڵ ئەوەشدا.

**sameness** (sam′nis), *n.* (١) چوونیەکی؛ وەك یەکی؛ لەیەکچوون. (٢) یەك ئەوایی؛ نەگۆڕان.

**samisen** (sam′i-se′), *n.* ئامێرێکی مۆسیقی سێ ژێیی یابانییە.

**samoan** (sə-mō′ən), *adj.* سامۆیی؛ تایبەتی بە گەل و کلتووری " سامۆوا " کە بریتییە لە کۆمەڵە دوورگەیەك لە زەریای هێندیدا

***n.*** (١) هاونیشتمانی " سامۆوا ".

(۲) زمانی " ساموٚوا "ییەکان.

**samovar** (sam′ə-vär′, säm′ə-vär′), *n.* سەماوەر.

**samp** (samp), *n.* لەپەی گەنمەشامی (خواردنێکی هیندی ئەمەریکییە).

**sampan** (sam′pən), *n.* جۆرە بەلەمێکی سەوڵو بایەوانی چینیو یابانییە.

**sample** (sam′p'l, säm′p'l), *n.* نموونە، وێنە؛ بەرکوڵ: ***( a ~ of his work)***

***v.t.*** (۱) بەرکوڵ کردن؛ خوێ چەشتن؛ تاقیکردنەوە.

(۲) نموونە لێ وەرگرتن.

**sampler** (sam′plēr, säm′plēr), *n.* (۱) نموونە کۆکەرەوەو تاقیکەرەوە. (۲) ئامێری نموونە وەرگرتن یا کۆکردنەوەو تاقیکردنەوە.

(۳) پارچە قوماشی نەخش‌ونیگار لەسەر کراو.

**sampling** (sam′pliŋ), *n.* (۱) نموونە کۆکردنەوەو تاقیکردنەوە.

(۲) شێوەی ئەم کۆکردنەوەو تاقیکردنەوەیە. (۳) نموونە؛ وێنە.

**samurai** (sam′oo-rī′), *n.* ساموورای: (ا) چینی سوپای یابان لەکاتی دەرەبەگیدا. (ب) ئەندامێکی ئەم چینە؛ جەنگاوەری یابانی.

**sanative** (san′ə-tiv), *adj.* [Rare], چاککەرەوە (نەخۆشی)؛ سازگار.

**sanatorium** (san′ə-tôr′i-əm, san′ə-tō′ri-əm), *n.* *Also*- **sanatarium,** (۱) بووژانگە: جێیەکی سازگارە بۆ بووژانەوەی ئەوانەی لە نەخۆشی هەڵساونەتەوە یا ئەوانەی تووشی نەخۆشی قورس بوون.

(۲) خەستەخانەی نەخۆشی قورس (وەك سیل).

**sanatory** (san′ə-tôr′i, san′ə-tō′ri), *adj.* سازگار؛ بۆ تەندروستی باش؛ چاککەرەوە.

**sanbenito** (san′bə-nē′tō), *n.* (۱) بەرگێکی گونییە کافری تۆبەکار لەبەری دەکرد لەکۆندا. (۲) بەرگێکی وەهای ڕەشە بە وێنەی شەیتانو گڕی ئاگرەوە ئەو کافرانەی سزای هەڵواسینیان بەسەردا درابوو لەبەریان دەکرد.

**sanctified** (saŋk′tə-fīd′), *adj.* (۱) پیرۆز؛ پیرۆزکراو.

(۲) **sanctimonious** .

**sanctify** (saŋk′tə-fī′), *v.t.* (۱) تەرخان کردن بۆکاری پیرۆز؛ پیرۆزکردن. (۲) پاك کردنەوە (لە گوناە)؛ گوناە پاك کردنەوە.

(۳) پیرۆزکردن لەڕووی ئاینەوە: ***( to ~ a marriage)*** .

(٤) چەسپاندنو پیرۆزکردنی نەریتێك؛ بە پیرۆز دانان.

**-samctification** ***(n.)*** ; **sanctifier** ***(n.)***.

**sanctimonious** (saŋk′tə-mō′ni-əs), *adj.* بە ڕووالەت زۆر خواپەرست؛ دووڕوویی ئاینی.

**sanctimony** (saŋk′tə-mō′ni), *n.* زۆر خواپەرستی ڕووالەت؛ دووڕوویێتی ئاینی؛ پیرۆزی درۆ.

**sanction** (saŋk′shən), *n.* (۱) دەسەلات پێدان؛ ڕێ پێدان.

(۲) پەسەندکردن؛ پاڵپشتی کردن؛ هاندان. (۳) سزا. (٤) یاسا؛ فەرماننامە.

(٥) (*pl.*)، سزای دراو بەسەر وولاتێکدا لەلایەن وولاتانی ترەوە: ***( to impose economic ~s on a country)***

***v.t.*** (۱) دەسەلات پێدان؛ مۆرکردن.

(۲) پەسەندکردن؛ پاڵپشتی کردن؛ هاندان؛ ڕێ پێدان.

**sanctity** (saŋk′tə-ti), *n.* (۱) پیاوچاکی؛ پاکی.

(۲) پیرۆزی؛ پیرۆزێتی: ***( the ~ of a church, mosque, temple)*** .

(۳) بە پیرۆز دانران: ***( the ~ of life)*** .

(٤) شتێکی پیرۆز.

**sanctuary** (saŋk′chōō-er′i), *n.* (۱) (ا) پەرستگا؛ شوێنێکی پیرۆز. (ب) ناوجەرگەی پەرستگا یا شوێنی پیرۆز. (ج) نزرگە؛ مەزارگە.

(۲) پەنا؛ پەناگا؛ پارێزگا؛ ئارامگە. (۳) دالدە.

(٤) پارێزگای باڵندەو گیاندار: جێیەکە تەرخان کراوە بۆ ژیانو زاوزێ کردنی ئەو گیاندارو باڵندانەی تیایدانو ڕاوکردنی تێدا قەدەغەیە.

**sanctum** (saŋk′təm), *n.* (۱) شوێنێکی پیرۆز.

(۲) خەڵوەتخانە؛ خەڵوەت؛ خەڵوەتگا؛ ژووری تایبەتی بە خۆ.

**sanctum sanctorum** (saŋk′təm saŋk-tôr′əm), (۱)- شوێنێکی زۆر پیرۆز؛ ناوجەرگەی شوێنێکی پیرۆز.

(۲) شوێنێکی تەنهاییو تایبەتی بە خۆ (لەڕووی گاڵتەوە).

**sand** (sand), *n.* (۱) لم.

(۲) (*pl.*)، کەنار دەریای لمین؛ شوێنی لمین.

(۳) لمی کاتژمێری لم.

(٤) (*pl.*)، ئەختاڵە کات؛ چرکە؛ تۆزە کات: ***( the ~ of life)*** .

(٥) [Slang]، ئازایی؛ غیرەت. (٦) ڕەنگی لم.

***v.t.*** (۱) لم پێوەکردن؛ لم هەڵپرژاندن بەسەردا.

(۲) ساف‌ولووس کردن بە سمارتە؛ سمارتە لێدان.

(۳) لم تێکەڵاوکردن؛ لم تێکردن.

(٤) بە لم داپۆشین.(٥) پڕکردن لە لم.

**sandal** (san′d'l), *n.* (۱) سۆل؛ کالە؛ پێڵاوی سەرڕێیی؛ نەعل.

(۲) قایشی سۆل.

**sandal** (san′d'l), *n.* = **sandalwood.**

**sandalwood** (san′d'l-wood′), *n.* (۱) داروتەختەی سەندەڵ (کە سەختو ڕەنگ کراوەو بۆن خۆشە). (۲) درەختی سەندەڵ.

**sandarac** (san′də-rak′), *n.* (۱) (ا) جۆرە درەختێکە لە توخمی سنەوبەر. (ب) جەوی ئەم درەختە.

(۲) **realgar** .

**sandarac tree,** جۆرە درەختێکی باکووری ئەفەریقایە لە توخمی سنەوبەر دارەکەی بۆن خۆشەو جەوی دەردەدات.

**sandbag** (sand′bag′), *n.* (۱) توورەکە لم؛ کیسە لم؛ گونیە لم.

(۲) تووڕەکەیەکی بچووكو باریکەلەیە پڕە لە لم (کە وەك چەك بەکاردەهێنرێت).

***v.t.*** (۱) تووڕەکە لم بەدەور یا لەبەردەمدا دانان (بۆ پاراستن لە لافاو .. هتد)؛ بەربەستکردن بە کیسە لم. (۲) تووڕەکەی بچووكو باریکەلەی پڕ لە لم پیادان.

(۳) [Colloq.]، بەزۆر شت پێ کردن.

**sand bar,** بستو یا بەرزایی لمی کەنار دەریاو ڕووبار (کە بەهۆی بەرزاو نیشتاوەوە درووست دەبێت).

**sandblast** (sand′blast′, sand′bläst′), *n.* (۱) تەووژمی هەوا یا هەڵمی تێکەڵ بە لم (کانزاو شووشەو دیواری پێ پاك دەکرێتەوەو ساف‌ولووس دەکرێت). (۲) مەکینەی ئەم پاك کردنەوەو ساف کردنە.

***v.t.*** پاك کردنەوەو ساف‌ولووس کردن بە تەووژمی هەواو لمی تێکەڵ بە لم.

**sand-blind** (sand′blīnd′), *adj.* نیمچە کوێر؛ چاوکز.

**sand-box** (sand′boks′), *n.* سنووقە لم (بۆ یاری منداڵان یا کردن بە مێڵی شەمەندەفەرەوە بۆ نەخلیسکان).

**sand-cast** (sand′kast′, sand′käst′), *v.t.* کانزا داڕشتن لە قاڵبی لمدا.

**sand crack,** قڵیشی سمی ئەسپ (دەبێتە هۆی شەل).

**sand dollar,** ژیشکی دەریا؛ گیاندارێکی خەپلەیی پانکەڵەیە حەز بە ناو لم دەکات.

**sand eel,** = **sand launce.**

**sander** (san′dẽr), *n.* (۱) ساف‌ولووسکەر بە سمارتە؛ سمارتەکەر؛ سمارتەلێدەر. (۲) مەکینەی سمارتەکەر؛ مەکینەی ساف‌ولووسکەر بە سمارتە.

(۳) لم بڵاوکەرەوە.

**sanderling** (san′dēr-liŋ), *n.* جۆرێکە لە چۆلەکەی لمی بچکۆلە.

**sand flea,** کێچی ناو لم.

**sand fly,** مێشی ناو لم.

**sand-glass** (sand′glas′, sand′gläs′), *n.* = **hourglass.**

**sand grouse,** مامری لم.

**sand hopper,** = **sand flea.**

**sand launce,** *Also* **sand launce** or **sand eel,** مارماسی لم.

**sand-lot** (sand′lot′), *adj.* تایبەتی بە یاری ناو لم یا دەشتی بەرەڵا (بەتایبەتی هی منالان): ***( ~ baseball)*** .

**sandman** (sand′man′), *n.* پیاوێکی ئەفسانەیییە گوایە منداڵ خەواڵوو دەکات بە لم پرژاندنە ناو چاویانەوە.

**sandpaper** (sand′pā′pēr), ***n.*** سمارته؛ کاغەزی سمارته.
***v.t.*** سمارتەکردن؛ سمارتەلێدان؛ ساف‌ولووس کردن بە سمارته.
**sandpiper** (sand′pīp′ēr), ***n.*** چۆلەکەی لم: باڵندەیەکی بچووکی دەنووک درێژو ڕێکە لە کەناری دەریادا دەژی.
**sandstone** (sand′stōn′), ***n.*** بەردە لم: لمی وەك بەرد لێ هاتوو.
**sandstorm** (sand′stôrm′), ***n.*** گەردەلوول؛ گێژەلووکەی لم؛ گێژەلووکە.
**sand-table** (sand′tā′b'l), ***n.*** (١) مێزێکی قەراغ بەرزە لمی لەسەر پۆدەکرێ بۆ یاری منداڵان. (٢) مێزێکی لم لەسەرە نەخشەی لەسەر دەکرێ بۆ مناوەرەی سوپایی فێرکردن. (٣) مێزێکی خلیسکی خوارە کانزای تێکەڵاو بە لمی دەکرێتە سەر بۆ جیاکردنەوەی.
**sandwich** (sand′wich), ***n.*** ساندویچ؛ بابۆڵە؛ تێشوو.
***v.t.*** (١) ترنجاندنە نێوان دوو شت یا کەسەوە؛ خستنە نێوانەوە وەك بەزۆر: *( to be ~ed between two things or persons)*
(٢) جێکردنەوە لە شوێنێکی تەسکدا بە ئاستەم.
**sandwich-man,** (١) کەسێکە کە تەختەیەکی ئاگاداری هەڵواسیوە بە سنگیدا و یەکێکیش بە پشتیداو دەگەڕێ بە شەقامەکاندا، واتە خۆی وەك ساندویچ لێکردووە. (٢) ساندویچ فرۆش؛ بابۆڵە دروستکەر.
**sandy** (san′di), ***adj.*** (١) لماوی؛ لمانی؛ لمی.
(٢) شلۆق؛ نەچەسپیو؛ بێ بناغە؛ خۆ ڕانەگر. (٣) ڕەنگ لمی.
-sandiness *(n.)*.
**sane** (sān), ***adj.*** (١) ژیر؛ بەمێشك: *( a ~ person)*.
(٢) بەجێ؛ دروست: *( a ~ policy)*.
**sang** (saŋ), *alternative past tense of* **sing.**
**sangaree** (saŋ′gə-rē′), ***n.*** جۆرێکە لە مەی
**sang-froid** (sän′frwå′), ***n.*** هێمنی؛ تێك نەچوون؛ لەسەرخۆیی؛ بەجەرگی.
**sanguinaria** (saŋ′gwi-nâr′i-ə), ***n.*** ڕووەکە خویناوی؛ ڕووەکێکە لە توخمی خاشخاش ڕەگەکەی گەورەیە بۆ دەرمان بەکاردەهێنرێت.
**sanguinary** (saŋ′gwi-ner′i), ***adj.*** (١) خوێنین؛ خویناوی؛ خوێن زۆر تیا ڕێژراو: *( a ~ battle)*.
(٢) خویناوی؛ بە خوێن داپۆشراو.
(٣) خوێنڕێژ؛ خوێنخۆر؛ پیاوکوژ: *( a ~ ruler)*
-sanguinarily *(adv.)* ; sanguinariness *(n.)*.
**sanguine** (saŋ′gwin), ***adj.*** (١) سوور (کولم. پێستی دەموچاو، ڕووخسار. (٢) سوور؛ ڕەنگ سوور؛ خوێنی.
(٣) بەجۆش؛ ڕووهەڵچوو؛ بەسۆز. (٤) خۆش بین؛ بە هیوا؛ دڵخۆش.
(٥) sanguinary
-sanguinely *(adv.)* ; sanguineness *(n.)*.
**sanguineous** (saŋ-gwin′i-əs), ***adj.*** (١) خویناوی؛ خوێنی تێدایە.
(٢) سوور؛ خوێنی (٣) خوێنین؛ تایبەتی بە خوێن ڕشتن.
(٤) خۆش بین؛ بە هیوا؛ پشت ئەستوور.
**sanguinolent** (saŋ-gwin′ə-lənt), ***adj.*** خویناوی؛ خوێنی پێوەیە
**sanicle** (san′i-k'l), ***n.*** ڕووەکێکی لاسك درێژە لە توخمی مەعدەنووس بۆ تەندروستی و دەرمان باشە.
**sanies** (sā′ni-ēz′), ***n.*** کێم و خوێن بە تێکەڵاوی.
-sanious *(adj.)*.
**sanitarian** (san′ə-târ′i-ən), ***adj.*** تایبەتی بەپاك‌وتەمیزی و تەندروستی
***n.*** تەندروستی زان؛ زانای تەندروستی.
**sanitarium** (san′ə-târ′i-əm), ***n.*** = **sanatorium.**
**sanitary** (san′ə-ter′i), ***adj.*** (١) هی تەندروستی؛ تەندروستی: *( the ~ conditions are poor)*
(٢) پاك‌وتەمیز؛ خاوێن

**sanitary engineer,** ئەندازیاری تەندروستی: ئەندازیارێکە سەرپەرشتی زێراب و ئاو دەکات.
**sanitary napkin,** دەسمەسڕی تەندروستی: پەڕۆیەکە بۆ هەڵمژینی خوێنی ئافرەت لەکاتی بێ نوێژیدا.
**sanitation** (san′ə-tā′shən), ***n.*** (١) تەندروستی گشتی؛ بە پاك‌وتەمیزی ڕاگرتنی زێراب و ئاوی ئاوشارو شتی وەها.
(٢) دەرکردن یا فڕێدانی پیسایی و چڵکاوی ئاو زێراب.
**sanity** (san′ə-ti), ***n.*** (١) ژیری؛ مێشك تەواوی.
(٢) بەجێیی و دروستی بڕیارو کردەوەی مرۆڤ.
**sank** (saŋk), *alternative past tense of* **sink.**
**sannup** (san′up), ***n.*** هیندی‌یەکی ئەمەریکی خێزاندار.
**sans** (sanz), ***prep.*** [Archaic or Poetic], بەبێ؛ بێ: *( ~ teeth)*.
**sanscrit** (san′skrit), ***n.*** = **sanskrit.**
**sansculotte** (sanz′koo-lot′, sanz′kyoo-lot′), ***n.*** بێ پانتۆڵ: (ا) شۆڕشگێڕێکی فەرەنسی‌یە لەکاتی شۆڕشی فەرەنسیدا (ووتەیەکی سووکە نرابووە پاڵ شۆڕشگێڕەکانەوە کە گوایە ڕەش و ڕووت و بێ پانتۆڵن).
(ب) شۆڕشگێڕ.
-sansculottic *(adj.)* ; sansculottism *(n.)*.
**sansei** (san′sā, sän′sā), ***n.*** ***Also*** **sansei,** نەوەی کۆچەری یابانی لە ئەمەریکا؛ ئەمەریکایی بە بنەچە یابانی.
**sansevieria** (san′sə-vi-ē′ri-ə), ***n.*** ڕووەکێکە لە توخمی شلێر گەڵاکانی ئەستوورو ڕەق و ڕم ئاسایین.
**Sanskrit** (san′skrit), ***n.*** سانسکریت: زمانی وێژەی کلاسیکی، واتە کۆنی هیند.
***adj.*** سانسکریتی؛ تایبەتی بە زمانی سانسکریت.
**Santa** (san′tə, san′ti), ***n.*** = **Santa Claus.**
***adj.*** پیرۆز؛ پیاوچاك. (نازناوێکە بەتایبەتی بۆ شار): *( Santa Barbara, Santa Fe, etc.)*
**Santa Claus; Santa Klaus** (san′tə klôz′), سانتەکلۆز: بەگوێرەی نەریتی خاچ پەرستان پیاوچاکێکە دیاری بۆ منداڵان دەهێنێت لە جەژنی کریسمەسدا.
**santonin ; santonine** (san′tə-nin), ***n.*** ئاوێتەیەکی بلووری بێ ڕەنگە (کیمیا).
**sap** (sap), ***n.*** (١) ئاووگ؛ ئاووك؛ ئاووکی بەرزەڕۆ و نزمەڕۆی ڕووەك و داودرەخت. (٢) ئاوی ژیان؛ خوێن.
(٣) تین؛ زیندەگی؛ زیندوویتی؛ چوست‌وچالاکی؛ گف‌وگوڕ؛ هێز.
(٤) sapwood . (٥) [Slang]، کەسێکی بێ مێشکی ساویلکەی بوودەڵە.
**sap** (sap), ***n.*** لەغەمێکی تەسك و دوورودرێژە لێ دەدرێت بۆ گەیشتنە بنکەی دوژمن.
***v.t.*** (١) بنکەن کردن.
(٢) هێز لێ بڕین؛ بێ تین کردن؛ ووشك کردنەوە؛ لاوازکردن: *( The heat ~ped his strength.)*
***v.i.*** (١) لەغەم لێدان؛ خەنەق لێدان.
(٢) گەیشتنە بنکەی دوژمن بە لەغەم.
**sapajou** (sap′ə-jōō′), ***n.*** مەیموون؛ جۆرە مەیموونێکە.
**sapanwood ; sappanwood** (sə-pan′wood′), ***n.*** (١) جۆرە درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بۆیەیەکی سووری لێ دەردەهێنرێت.
(٢) داری ئەم درەختە.
**saphead** (sap′hed′), ***n.*** [Colloq.], کەسێکی بێ مێشك و ساویلکە.
**sapheaded** (sap′hed′id), ***adj.*** [Colloq.], بێ مێشك؛ کەر؛ گەوج؛ ساویلکە.
**saphena** (sə-fē′nə), ***n.*** یەکێکە لە دوو دەماری گەورەی خوێن لەلاقدا.
-saphenous *(adj.)*.
**sapid** (sap′id), ***adj.*** (١) بەتام؛ تام و بۆن خۆش.
(٢) خۆش (بۆ زاخاوی مێشك).

-**sapidity** *(n.).*

**sapience** (sā′pi-əns), *n. Also* **sapiency,** دانایی؛ ژیری؛ زانایی.

**sapient** (sā′pi-ənt), *adj.* دانا (هەندێك جار لەڕووی لاقرتێوە)؛ ژیر؛ زانا

**sapless** (sap′lis), *adj.* (١) ووشك‌و برنگ؛ سیس؛ بێ ئاووک.
(٢) بێ هێز؛ سست؛ لاواز؛ بێ تاقەت؛ بێ تین؛ مردوو (مەجاز).

**sapling** (sap′liŋ), *n.* (١) نەمام (٢) لاو؛ گەنج. (٣) بەچکە تانجی.

**sapodilla** (sap´ə-dil′ə), *n.* (١) درەختێکی هەمیشە سەوزی ناوچە گەرم‌و تەڕەکانی ئەمەریکایە. (٢) بەری ئەم درەختە.

**saponaceous** (sap´ə-nā′shəs), *adj.* سابوناوی؛ سابوونی.

**saponifiable** (sə-pon´ə-fī′ə-b'l), *adj.* دەکرێ بە سابوون.

**saponify** (sə-pon′ə-fī′), *v.t.* کردن بە سابوون.
*v.i.* بوون بە سابوون.

-**saponifier** *(n.)*; **saponification** *(n.).*

**saponin** (sap′ə-nin), *n.* سابۆنین: ماددەیەکی سابوونی‌یە لە دارسابووندا (کیمیا).

**sapor ; sapour** (sā′pēr, sā′pôr), *n.* بۆن‌و بەرامە؛ بۆن؛ تام.

-**saporous** *(adj.).*

**sapota** (sə-pō′tə), *n.* = **sapodilla.**

**sappanwood** (sə-pan′wood´), *n.* = **sapanwood.**

**sapper** (sap′ēr), *n.* ئەندازیاری سوپا (بەتایبەتی هی ئینگلیزی).

**sapphire** (saf′īr), *n.* (١) گەوهەری شین؛ یاقووتی شین.
(٢) ڕەنگی ئەم بەردە بەنرخە.
*adj.* شینی ئاسمانی؛ شینی یاقووتی؛ شینی مەیلەو سەوز.

**sapphirine** (saf′ēr-in, saf′ə-rīn´), *adj.* شینی یاقووتی؛ شینی ئاسمانی.
*n.* سلیکاتی مەگنیسیۆم‌و فافۆنی شین یا سەوز.

**sapphism** (saf′iz'm), *n.* = **lesbianism.**

**sappy** (sap′i), *adj.* (١) تەڕوبڕ؛ ئاودار.
(٢) بەتین؛ زیندوو؛ بە کف‌وکوڕ؛ چوست‌وچالاك؛ بەهێز.
(٣) [Slang]، هیچ‌وپووچ؛ بێ تام؛ بێ مانا.

-**sappily** *(adv.)* ; **sappiness** *(n.).*

**sapremia , sapraemia** (sə-prē′mi-ə), *n.* = **septicemia.**

**sapro- ;sapr-** (sap′rō, sap′rə), پێشگرێکە بەمانای: ڕزیو؛ گەنیو؛ مردوو: پووکانەوە؛ پواو: *(saprogenic)* .

**saprogenic** (sap´rə-jen′ik), *adj. Also* **saprogenous,** (١)- پووکێنەرەوە؛ دەبێتە هۆی ڕزان یا گەنین. (٢) لە پووکانەوە یا ڕزینەوە هاتووە.

**saprolite** (sap′rə-līt´), *n.* بەردی ڕزیو یا پووکاوە.

**saprophagous** (sə-prof′ə-gəs), *adj.* بۆگەنخۆر؛ شتی گەنیو خۆر

**saprophyte** (sap′rə-fīt´), *n.* زیندەوەرێك یا ڕووەکێکە کە لەسەر شتی گەنیو‌و پووکاوە دەژی.

-**saprophytic** *(adj.).*

**sapsucker** (sap′suk´ēr), *n.* ئاووک هەڵمژە: دارکونکەرەیەکە ئاووکی دار هەڵدەمژێت

**sapwood** (sap′wood´), *n.* ئەو چینە ئاووکدارە نەرمەی قەدی درەختە کە لەژێر توێکڵەکەوەیە.

**saraband** (sar′ə-band´), *n.* سەربەند: (ا) سەمایەکی ئیسپانی جوانە (ب) مۆسیقای ئەم سەمایە.

**saracen** (sar′ə-s'n), *n.* (١) عەرەب
(٢) موسڵمان (بەتایبەتی لەکاتی شەڕی خاچ پەرستیدا).

**sarcasm** (sär′kaz'm), *n.* (١) تەوس؛ لاقرتێ.
(٢) لاقرتێ کردن؛ بە تەوسەوە ووتن.

**sarcastic** (sär-kas′tik), *adj.* (١) بە تەوس؛ بە لاقرتێ؛ بە تەوسەوە: *(a ~ statement)*
(٢) حەز بە لاقرتێ کەر؛ قسە بە تەوس: *(a ~ person)* .

-**sarcastically** *(adv.).*

**sarcenet** (särs′net), *n.* قوماشێکی ئاوریشمی نەرم‌و تەنکە.

**sarco- ; sarc-** (sär′kō, sär′kə), پێشگرێکە بەمانای: گۆشت: *(sarcology)*

**sarcocarp** (sär′kə-kärp´), *n.* (١) گۆشتی میوەی ناوکدار (قۆخ، هەڵووژە). (٢) گۆشتی میوە؛ کرۆکی میوە.

**sarcology** (sär-kol′ə-ji), *n.* توێکاری ڕیشاڵە نەرمەکانی لەش.

**sarcoid** (sär-koid′), *adj.* گۆشتی؛ گۆشت ئاسا؛ لە گۆشت چوو.

**sarcoma** (sär-kō′mə), *n.* سندانی شێرپەنجەیی ڕیشاڵە لێکدەرەکانی لەش.

**sarcomatosis** (sär-kō´mə-tō′sis), *n.* تەنینەوەی سندانی شێرپەنجەیی بە ڕیشاڵە لێکدەرەکانی لەشدا.

**sarcophagus** (sär-kof′ə-gəs), *n.* دارتەرمی بەردین.

**sarcous** (sär′kəs), *adj.* (١) گۆشتی؛ لە گۆشت پێکهاتوو.
(٢) ماسولکەیی؛ لە ماسولکە پێکهاتوو.

**sard** (särd), *n.* سەرد: جۆرێکە لە یاقیقی ڕووناکی سووری پرتەقاڵی.

**sardine** (sär-dēn′), *n.* ساردین؛ جۆرە ماسی‌یەکی زۆر بچکۆلەیە دەکرێتە قوتووەوە.

**sardius** (sär′di-əs), *n.* = **sard.**

**sardonic** (sär-don′ik), *adj.* لاقرتێیی؛ بە تەوسەوە؛ لاقرتێکەر: *(a ~ smile, tone of voice, etc.)*

-**sardonically** *(adv.).*

**sardonyx** (sär′də-niks), *n.* جۆرێکە لە یاقیق هێڵی سوورو پرتەقاڵی یان قاوەیی‌و سپی تەریبی تێدایە

**sargasso** (sär-gas′ō), *n.* جۆرێکە لەگیای دەریایی

**sarge** (särj′), *n.* [Colloq.] = **sergeant.**

**sari** (sä′rē), *n.* ساری: کراسی ئافرەتی هیندی.

**sark** (särk), *n.* [Scot. or Archaic], = **shirt.**

**sarmentose** (sär-men′tōs), *adj.* تەرزی باریك‌و درێژ فڕێندەری ڕەگ داکوتاو وەك شلیك.

**sarong** (sə-rôŋ′, sä´rôŋ′), *n.* بەرگێکی ژنانە‌و پیاوانەی دوورگەکانی پاسیفیکە بریتی‌یە لە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگی لەخۆوە پێچراو وەك پەشتەمال یا تەنوورە.

**sarracenia** (sar´ə-sē′ni-ə), *n.* ڕووەکێکی زەلکاوی ئەمەریکی‌یە گەڵاکانی لە سوراحی دەچن جانەوەر دەگرن وەك تەڵە بۆ خۆراکی ڕووەکەکە.

**sarsaparilla** (särs´pə-ril′ə), *n.* (١) ڕووەکێکی ناوچە گەرمەکانی ئەمەریکایە ڕەگەکانی بۆن خۆشن‌و گەڵاکانی لە دڵ دەچن.
(٢) ڕەگی ووشك کراوەی ئەم ڕووەکە (بۆ تام‌و بۆن خۆش کردن بەکاردێت).
(٣) خواردنەوەیەکی شیرینە ئەم بۆن‌و بەرامەیەی تێکراوە.

**sartor** (sär′tēr), *n.* بەرگدروو (ووشەیەکی وێژەیی‌و قۆشمەیە).

**sartorial** (sär-tôr′i-əl, sär-tō′ri-əl), *adj.* (١) بەرگدروویی؛ هی بەرگدرووان‌و پیشەکەیان.
(٢) بەرگی؛ تایبەتی بە جل‌وبەرگ (بەتایبەتی هی پیاوان).
(٣) تایبەتی بە ماسولکەی بەرگدروو (ووشەی داهاتوو ببینە).

**sartorious** (sär-tôr′i-əs, sär-tō′ri-əs), *n.* ماسولکەی بەرگدروو؛ ماسولکەیەکی باریك‌و درێژە بە درێژایی پێشەوەی ڕان.

**sash** (sash), *n.* پشتێن.

**sash** (sash), *n.* چوارچێوە خلیسکەی دەرگاو پەنجەرە.

**sashay** (sa-shā′), *v.i.* [Colloq.], (١) بە کەش‌وفشەوە ڕۆیشتن؛ خۆبادان. (٢) هەنگاونان لە سەمادا بە شێوەی خلیسکان.
*n.* [Colloq.], گەشت؛ گەڕان؛ سەیران.

**saskatoon** (sas′kə-tōōn´), *n.* ساسکەتوون: دەوەنێکی ئەمەریکایی گوڵ سپی‌یە بەرەکەی دەخورێت.

**sass** (sas), *n.* [Colloq.], بێ شەرمی؛ چارقایمی؛ قسە پێ ووتنەوە؛

لە گەورەی خۆ هەلگەڕانەوە.

**sassaby** (sas′ə-bi), *n.* جۆرە ئاسکە کێوی‌یەکی گەورەی ئەفەریقایی‌یە.

**sassafras** (sas′ə-fras′), *n.* (١) ساسافراس: جۆرە درەختێکی ئەمەریکی گوڵ زەردی بەردارە. (٢) توێکڵی وشك کراوەی ئەم درەختە (بۆ پزیشکەوانی و تام خۆش کردن بەکاردەهێنرێت). (٣) ئەم تام و بۆن و بەرامەیە.

**sassy** (sas′i), *adj.* [Colloq.]. (١) بێ حەیا؛ چەقاوەسوو؛ بزێو دەم هەراش *( a ~ child)*. (٢) زەق و بێ شەرمانە (جل‌وبەرگ).

-sassily *(adv.)*; sassiness *(n.)*.

**sassy** (sas′i), *n.* درەختێکی ئەفەریقایی توێکڵ و دار ژەهراوی‌یە. (پێشی دەوترێ: " sassy bark ").

**sassywood** (sas′i-wood′), *n.* = sassy.

**sat** (sat), *past tense and past participle of* sit.

**satan** (sā′t'n), *n.* شەیتان

**satanic** (sā-tan′ik, sə-tan′ik), *adj.* شەیتانی؛ شەیتانانە.

-satanical *(adj.)* ; satanically *(adv.)*.

**Satanism** (sā′t'n-iz'm), *n.* شەیتان پەرستی

**satchel** (sach′əl), *n.* جانتای دەست؛ جانتای قوتابی.

**sate** (sāt), *v.t.* (١) تێرکردن (٢) نینتەلاپێکردن؛ لە ئەندازە بەدەر تێرکردن؛ لەبەرچاو خستن (بەهۆی زۆر پێدانەوە؛

**sat** (sat, sāt), *archaic past tense and past participle of* sit.

**sateen** (sa-tēn′), *n.* ساتین: قوماشێکی لووسی لۆکەیە لە ئاوریشم دەچێت.

**satellite** (sat′ə-līt′), *n.* (١) بەردەست؛ کلك (مرۆڤ)؛ دواکەوتە؛ پاشکۆ؛ کلکەلەقنێکەر. (٢) ئەستێرەیەکی گەڕۆکی بچووکە کە بەدەوری یەکێکی گەورەتردا دەسووڕێتەوە؛ مانگ. (٣) مانگی دەستکرد. (٤) وڵاتی پاشکۆ (کە ژێردەستەی وڵاتێکی گەورەترە لە خۆی و لە قسەی دەرناچێ)؛ کلك (وڵات)

**satiability** (sā′shi-ə-bil′ə-ti, sā′shə-bil′ə-ti), *n.* تێری؛ تێربوون؛ تێرخواردن.

**satiable** (sā′shi-ə-b'l, sā′shə-b'l), *adj.* تێر دەبێت؛ تێر دەخوات؛ تێر دەکرێت؛ تێربوونی بۆ هەیە.

-satiableness *(n.)* ; satiably *(adv.)*.

**satiate** (sā′shi-āt′), *adj.* تێر؛ تێروتەسەل؛ مڕ.

*v.t.* (١) تێرکردن (٢) لەبەرچاو بردن (بە زۆر تێرکردن)؛ زۆر مڕکردن.

-satiation *(n.)*.

**satiety** (sə-tī′ə-ti), *n.* (١) تێری؛ تێربوون؛ مڕبوون. (٢) لەبەرچاوکەوتن (لەبەر زۆر تێری)؛ زۆر تێری؛ زۆر مڕی.

**satin** (sat′'n), *n.* قوماشی ئاوریشم.

*adj.* ئاوریشمی؛ ساف‌ولووس.

**satinet ; satinette** (sat′'n-et′), *n.* (١) قوماشی ئاوریشمی تەنك و گەنگ. (٢) قوماشێکی ئەستووری لۆکە و خوری‌یە.

**satinwood** (sat′'n-wood′), *n.* (١) دار و تەختەیەکی ساف‌ولووسە کەرەسەی ناومالی لێ درووست دەکرێت. (٢) درەختێکی " ماهۆگەنی "یە دار و تەختەکەی زۆر ساف‌ولووسە.

**satiny** (sat′'n-i), *adj.* ئاوریشمی؛ ساف‌ولووس و بریقەدار.

**satire** (sat′īr), *n.* (١) هەڵبەست یا چیرۆکی لاقرتێ و داشۆری و دەمەلاسکێ و پلارهاوێژی. (٢) (ا) وێژەی وەها. (ب) هونەری نووسینی ئەم جۆرە وێژەیە (٣) بەکارهێنانی لاقرتێ، دەمەلاسکێ، یا قسەی بە توێکڵ لە دوان یا نووسیندا؛ پلارهاویشتن

**satiric** (sə-tir′ik, sa-tir′ik), *adj.* = satirical.

**satirical** (sə-tir′i-k'l, sa-tir′i-k'l), *adj.* لاقرتێیی؛ دەمەلاسکەیی؛ پلارهاوێژی: *( a ~ poem, piece of writing, etc.)*.

-satirically *(adv.)* ; satiricalness *(n.)*.

**satirist** (sat′ə-rist), *n.* (١) نووسەری هەڵبەست یا چیرۆکی لاقرتێ و پلارهاویشتن. (٢) لاقرتێکەر؛ پلارهاوێژ.

**satirize** (sat′ə-rīz′), *v.t.* لاقرتێ پێکردن؛ پلار تێگرتن؛ گاڵتەپێکردن؛ دەمەلاسکێ کردن.

**satisfaction** (sat′is-fak′shən), *n.* (١) دڵ ئاوخواردنەوە؛ ڕەزامەندی؛ ڕازی کردن؛ ڕازی بوون. (٢) (ا) گوناه یا تاوان پاکردنەوە بە سزا چەشتن (ئاین). (ب) بۆ بژاردن (ج) قەرزدانەوە؛ ئەرکی سەرشان بەجێهێنان. (٣) هۆی ڕەزامەندی؛ هۆی دڵ ئاوخواردنەوە.

give satisfaction, (١) ڕازی کردن؛ قایل کردن؛ دڵ ئاو پێ خواردنەوە. (٢) ڕازی بوون بە شیربازی لەگەڵ کردن یا زۆران لەگەڵ گرتن.

to one's (own) satisfactizzon, بە دڵی خۆ.

**satisfactorily** (sat′is-fak′tēr-ə-li), *adv.* بە باشی؛ بە ڕێك‌وپێکی: *( to do a job ~ )*.

**satisfactory** (sat′is-fak′tēr-i), *adj.* باش؛ مام ناوەندی؛ پەسەند: *( to get a ~ grade on a test ; to do a ~ job)*

-satisfactoriness *(n.)*.

**satisfy** (sat′is-fī), *v.t.* (١) (ا) ڕازی کردن. (ب) ئارەزوو شکاندن. (٢) پەیڕەوی کردن. (٣) دڵنیا کردن. (٤) (ا) دانەوە (قەرز) (ب) ئەرکی سەرشان بەجێهێنان. (٥) بۆ بژاردن.

*v.i.* ڕازی بوون؛ دڵ ئاوخواردنەوە؛ دڵنیابوون.

**satrap** (sā′trap, sat′rəp), *n.* (١) فەرمانڕەوای ناوچەیی ئێرانی کۆن. (٢) فەرمانڕەوای خواردەست یا ئاسەرەکی بەزەبرووزەنگ.

**satrapy** (sā′trə-pi, sat′rə-pi), *n.* (١) دەسەڵات و پلەوپایەیەی فەرمانڕەوای ناوچەیی ئێرانی کۆن؛ فەرمانڕەوایەکی وەها. (٢) ناوچەیەکی ئێرانی کۆن

**saturant** (sach′ēr-ənt), *n.* ماددەی تێرکەر یا تێراوکەر

**saturate** (sach′oo-rāt′), *v.t.* (١) تێرکردن؛ تێراوکردن؛ پاراوکردن؛ لە ئەندازە بەدەر تێکردن (٢) خووساندن؛ لە شلە هەڵکێشان؛ سەرانسەر یا هەموو گرتنەوە. (٣) پڕکردن؛ زۆر پڕکردن؛ زۆر تێکردن. (٤) تێدا تواندنەوە هەتا بتوانرێ (کیمیا)؛ یەق پێکردنەوە (کیمیا).

*adj.* (١) تێراو؛ پڕ؛ پاراو؛ تێر. (٢) تۆخ (ڕەنگ).

-saturable *(adj.)* ; saturability *(n.)* ; saturator *(n.)*.

**saturated** (sach′oo-rāt′id), *adj.* (١) تێراو؛ پاراو؛ تێر؛ پڕ (هەڵمژین). (٢) خووساو.

**saturation** (sach′oo-rā′shən), *n.* (١) (ا) تێراوی؛ تێری؛ پاراوی؛ پڕی (هەڵمژین)؛ خووسان. (ب) تێراوکردن؛ پاراوکردن؛ پڕکردن؛ تێرکردن (٢) یەق کردنەوە (کیمیا). (٣) پاراوی موگناتیسی. (٤) ڕوونی یا تۆخی ڕەنگ. (٥) پڕکردنی بازاڕ لە فرۆتەنی‌یەك. (٦) داگرتنەوەی نیشانێك بە بۆمبا یا مووشەك و لەناوبردنی.

**saturation point,** پلەی تێراوی، پاراوی، یا پڕی؛ پلەی یەقکردنەوە.

**Saturday** (sat′ēr-di), *n.* شەممە.

**Saturn** (sat′ērn), *n.* (١) خودای کشتوکاڵ (ئەفسانەی ڕۆمانی). (٢) ساتۆرن: دووەم گەورەترین ئەستێرەی گەڕۆکە و شەشەمە لە دووری‌یەوە لە خۆر؛ ئەستێرەیەکی بەیانی‌یە دوای نیوەشەو هەڵدێت. (٣) قوڕقوشم.

**saturnalia** (sat′ēr-nā′li-ə), *n.* (١) ئاهەنگی خودای ڕۆمانی " ساتۆرن ". (٢) ئاهەنگی بەرەڵلا.

**Saturnian** (sə-tũr′ni-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە خودای ڕۆمانی " ساتۆرن" لە چەرخەکەی ڕۆنی دەووترا " سەردەمی زێڕین". (٢) خۆش گوزەرانی؛ خۆشی و ئاسوودەیی.

(۳) تایبەتی بە ئەستێرەی گەڕۆکی " ساتۆرن ".

**saturniid** (sə-tûr′ni-id), *n.* جانەوەرێکی باڵدارە لە پەپوولە دەچێت.

**saturnine** (sat′ĕr-nīn′), *adj.* (۱) سست؛ خاو؛ بەرچاو تاریك؛ ڕووگرژ؛ مۆن؛ بەست؛ بەدبین؛ ئەدوو. (۲) (ا) قورقوشمی.

(ب) ژەهری قورقوشم لێدراو.

**saturnism** (sat′ĕr-niz′m), *n.* ژەهری قورقوشم لێدان.

**satyr** (sat′ĕr, sā′tĕr), *n.* (۱) بوونەوەر یا دەعبایەکی حەشەری سەرخۆشی دارستانە لە ئەفسانەی یۆناندا گوێی قوتەو شاخەکانی کورتن سەرو لەشی لەهی مرۆڤ دەچێت و لاقی لە هی بزن.

(۲) پیاوێکی حەشەری؛ پیاوی بەخرۆش؛ پیاوی کیرچلێس.

(۳) جۆرێکە لە پەپوولەی باڵ قاوەیی.

**-satyric ; satyrical** *(adj.).*

**satyriasis** (sat′ə-rī′ə-sis), *n.* حەشەرێتی بی ئەندازەی پیاو؛ زۆر بەخرۆشی (پیاو).

**satyromaniac** (sə-tir′ōmā′ni-ak′), *n.* پیاوی زۆر حەشەری.

**sauce** (sôs), *n.* (۱) سۆس؛ ساس. (۲) میوەی هاڕاو لێنراو.

(۳) ئاوی شلە (٤) مەزە زیادکەر؛ خۆشکەر؛ تام پێدەر؛ تام خۆشکەر.

(٥) [Colloq.]، بێ حەیایی؛ بێ شەرمی. (٦) [Dial]، سەوزە.

(۷) [Slang]، مەی؛ عەرەق.

**sauce-box** (sôs′boks′), *n.* [Colloq.], منداڵێکی چەقاوەسوو یا بێ حەیا

**saucepan** (sôs′pan′), *n.* مەنجەڵۆکەی دەسکدار.

**saucer** (sô′sĕr), *n.* ژێرپیاڵە؛ ژێر کووپ.

**saucy** (sô′si), *adj. Also* sassy, (۱) بێ شەرم؛ بێ حەیا؛ چەقاوەسوو؛ لە گەورەی خۆ هەڵگەڕاوە (۲) قنج وقیت؛ بەجۆش؛ بزێو. (۳) تەڕپۆش.

**-saucily** *(adv.)* ; **sauciness** *(n.).*

**sauerkraut** (sour′krout′), *n. Also* **sour-crout**, ترشیاتی کەلەرم (خواردنێکی ئەڵمانییە).

**sauger** (sô′gĕr), *n.* جۆرە ماسییەکی ڕوباری ئەمەریکییە

**sauna** (sou′nä), *n.* سۆنە. گەرماوی هەڵم.

**saunter** (sôn′tĕr), *v.i.* پیاسەکردن؛ لۆژلۆژ ڕۆیشتن.

*n.* پیاسە؛ لۆژ لۆژ ڕۆیشتن.

**saurel** (sô′rəl), *n.* ماسییەکی دەریاییە.

**saurian** (sô′ri-ən), *adj.* مارمێلکەیی؛ تایبەتی بە مارو مارمێلکەو تیمساح و داینەسۆر

*n.* مارمێلکەو توخمەکەی کە تیمساح و داینەسۆریش دەگرێتەوە بەپێی پۆل پۆل کردنی کۆن

**sauro-** (sô′rō, sô′rə), *Also* **saur-**, پێشگرێکە بە مانای مارمێلکە:
***(sauropod)***

**sauropod** (sô′rə-pod′), *n.* جۆرێکە لە داینەسۆر کە گیاندارێکی زلی قرتێکەوتووە

*adj.* تایبەتی بەم گیاندارەو توخمە قرتێکەوتووەکەی.

**-sauropodous** *(adj.).*

**saury** (sô′ri), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریایی باریکەلەی لموز درێژە

**sausage** (sô′sij), *n.* گۆشتی قیمەکراوی بەهارات پێوەکراوی وەك مارمارە لێکراو

**sauté** (sō-tā′), *adj.* سوورەوەکراو

*v.t.* سوورکردنەوە (پیاز) ***(to ~ some onions)*** .

*n.* خواردەمەنی سوورەوەکراو

**sauterne** (sō-tûrn′), *n. Also* **sauternes**, جۆرێکە لە شەرابی سپی

**savage** (sav′ij), *adj.* (۱) دڕندە ***(a ~ tiger, person, etc.)*** .

(۲) کێوی؛ سەرەتایی؛ دەشتەکی؛ بێ شارستانی: ***(a ~ tribe)*** .

(۳) بێ ئەزاکەت؛ کەرتر؛ هیچ نەزان (٤) دڵڕەق؛ بێ بەزەیی

(٥) تووڕەوتڕۆ؛ تەنگەجیکلانە.

*n.* (۱) کەسێکی دەشتەکی و هیچ نەزان؛ کەسێکی کێوی و بێ شارستانی

(۲) کەسێکی دڕندەو بێ بەزەیی. (۳) کەسێکی بێ ئەزاکەت و ڕەشۆکی.

**-savagely** *(adv.)* ; **savageness** *(n.).*

**savagery** (sav′ij-ri), *n.* (۱) کێوێتی؛ دەشتەکێتی؛ بێ شارستانێتی.

(۲) دڕندەیەتی؛ دڕندەیی. (۳) کردەوەی دڕندانە.

(٤) دڕندە گەل؛ گیانداری دڕندە بەگشتی.

**savagism** (sav′ij-iz'm), *n.* = **savagery.**

**savanna, savannah** (sə-van′ə), *n.* (۱) دەشتی ڕووت وقووت و بێ دارودرەخت (بەتایبەتی لە نزیکی ناوچە گەرمەکان).

(۲) لەوەڕگای کەم دارودرەخت (بەتایبەتی لە ناوچە گەرمەکانی زەویدا).

**savant** (sə-vänt′, sav′ənt), *n.* زانا؛ دانا.

**save** (sāv), *v.t.* (۱) ڕزگارکردن (لە مەترسی):
***(to ~ a person from drowing)***

(۲) پاراستن؛ هێشتنەوە بۆ دواڕۆژ.

(۳) پاشەکەوت کردن؛ هەڵگرتن؛ خستنەلاوە؛ کۆکردنەوە (پارە):
***(She ~s half of her salary.; We have to ~ up some money for the trip.; We should ~ some of this meat for tomorrow.)***

(٤) بۆ گەڕاندنەوە؛ بۆ هێشتنەوە؛ لە کیس نەدان:
***(This train ~s several hours.; That will ~ me a lot of trouble.)***

(٥) ڕزگارکردن (لە گوناه):
***(Christ came into the world to ~ sinners.)***

*v.i.* (۱) پاشەکەوت کردن؛ پارە کۆکردنەوە؛ پارە هەڵگرتن.

(۲) ڕزگارکردن. (۳) پاراستن. (٤) مانەوە؛ لەناو نەچوون.

(٥) ڕزگارکردن (لە گوناه).

**-savable ; savaeble** *(adj.).*

**save** (sāv), *prep.* بێجگە لە؛ جگە لە:
***(No man enjoys self-reproach ~ a masochist.)***

*conj.* (۱) جگە لە؛ بێجگە لە.

(۲) [Archaic]، تەنها؛ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت:
***(I am fine ~ that I have a cold.)***

**save-all** (sāv′ôl′), *n.* (۱) گشت پارێزەر (نامێن).

(۲) بەرگی ئاودامانی دەرەوە (وەك هی کرێکار)

**saver** (sāv′ĕr), *n.* پاشەکەوتکەر؛ لەکیس نەدەر
(ئەم ووشەیە لە ووشەی ناوێتەدا بەکاردەهێنرێت): ***( labor ~ ; time ~ )*** .

**savin; savine** (sav′in), *n.* (۱) جۆرە سەروویەکی پەل بڵاوی کورتە؛ سەرووی کێوی. (۲) ڕۆنی ئەم سەرووە (دەکرێت بە دەرمان).

**saving** (sāv′iŋ), *adj.* (۱) ڕزگارکەر؛ پارێزەر

(۲) پاشەکەوتکەر؛ پارە کۆکەرەوە یا هەڵگر. (۳) بێجگەلێکەر.

(٤) بۆ گەڕێنەرەوە؛ بۆ هێڵەرەوە

*n.* (۱) ڕزگارکردن؛ پاراستن.

(۲) پاشەکەوت کردن؛ پارە هەڵگرتن یا کۆکردنەوە.

(۳) بۆ گەڕانەوە؛ بۆمانەوە. ***( a ~ of 10% )***

(٤) (*pl.*). پارەی نوستوو؛ پارەی مۆڵ؛ پارەی پاشەکەوت کراو یا هەڵگیراو

(٥) دەرهاویشتن؛ بێجگەکاری؛ نەگرتنەوە.

**saving** (sāv′iŋ), *prep.* (۱) دوور لە ڕووت؛ لەگەڵ ڕێزمدا (بۆ نیوە).

(۲) جگە لە؛ بێجگە لە.

*conj.* جگە لە؛ بێجگە لە

**saving account,** حسابی پاشەکەوت (لە بانقدا).

**saving bank,** بانقی پاشەکەوت.

**savior, saviour** (sāv′yĕr), *n.* (۱) ڕزگارکەر؛ ئازادکەر.

(۲) [S-]، عیسا ***( The ~ )***

**savoir-faire** (sav′wär-fâr′), *n.* [Fr.]. سەلیقە؛ لێهاتوویی کۆمەڵایەتی؛ دانایی کۆمەڵایەتی

**savor , savour** (sā'vēr), ***n.*** (١) (ا) تام؛ بۆن و بەرامە؛ بۆن؛ چەژ؛
چەش (ب) تامی تایبەتی؛ بۆن و بەرامەی تایبەتی. (٢) تایبەخۆ.
(٣) نیشانە (٤) [Archaic]، ناوبانگ؛ ناو.
***v.i.*** (١) بۆنێکی تایبەتی لێهاتن؛ تامێکی تایبەتی بوون:
***( Italian cooking ~s of garlic.)***
(٢) لەوەچوون؛ لێکردن؛ لێچوون؛ وەك ئەوە وابوون.
(٣) دەرخستن؛ نیشانەی ئەوە بوون.
***v.t.*** (١) تامێکی تایبەتی پێدان.
(٢) تامێك یا بۆن و بەرامەیەکی تایبەتی هەبوون.
(٣) لەوەچوون؛ نیشانەی ئەوە بوون؛ دەرخستن.
(٤) بە دڵەوە نووسان؛ پێ خۆش بوونی تام و بۆنی شتێك؛ بەدڵ بوون؛
بە خۆشییەوە چەشتن: ***( He ~ed the wine.)***
**savorless ; savourless** (sā'vēr-lis), ***adj.*** بێ تام؛
بێ تام و بۆن و بەرامەی تایبەتی.
**savory; savoury** (sā'vēr-i), ***adj.*** (١) تام و بۆن و بەرامە خۆش.
(٢) توون؛ مرر؛ تیژ (٣) خۆش؛ پەسەند.
(٤) بەجێ (لەڕووی نەریتی کۆمەڵایەتییەوە)؛ درووست؛ پەسەند؛ بەڕێز.
***n.*** [British], بەرخۆراك؛ مەزە؛ پاش خۆراك
**savory** (sā'vēr-i), ***n.*** جاترە کێویلە.
**savoy** (sə-voi'), ***n.*** جۆرێکە لە کەلەرمی گەڵا چرچ و لۆچ.
**savvy** (sav'i), ***v.i.*** [Slang], سەر لێ دەرچوون؛ لێ زانین؛ تێگەیشتن.
***n.*** [Slang], سەلیقە؛ دانایی؛ ژیری؛ تێگەیشتن.
***adj.*** [Slang], زۆرزان؛ دانا؛ زیرەك؛ لێهاتوو؛ سەردەرچوو.
**saw** (sô), ***n.*** مشار.
***v.t.*** (١) بە مشار بڕینەوە؛ بڕینەوە. (٢) بە مشار ڕێك و پێك کردن.
(٣) بزواندن بە شێوەی مشارکاری.
***v.i.*** (١) بە مشار بڕینەوە؛ بڕینەوە.
(٢) بڕانەوە ***( This wood ~s easily.)***
**saw** (sô), ***n.*** پەند؛ قسەی پێشینان؛ قسەی نەستەق
**saw** (sô), *past tense of* **see.**
**sawbuck** (sô'buk'), ***n.*** (١) ئەسپی مشارکاری.
(٢) [Slang]، پارەی دە دۆلاری
**sawdust** (sô'dust'), ***n.*** ئاردە مشار؛ ئاردە دار.
**sawfish** (sô'fish'), ***n.*** ماسییە مشاری ماسییەکی دەریایی
دڕندەیە
لمۆزەکەی لە مشار دەچێت.
**sawfly** (sô'flī'), ***n.*** مێشە مشاری: جۆرە مێشێکە قورتمی مێیەکەی لە
مشار دەچێت قەدی ڕووەکی پێ دەبڕێ و گەراکەی تێ دەخات.
**sawgrass,** گیا مشاری گیایەیەکە قەراغی گەڵاکانی لە مشار دەچێت.
**sawhorse** (sô'hôrs'), ***n.*** ئەسپی مشارکاری: چوارچێوەیەکی دارینە
داری لەسەر دەبڕێتەوە بە مشار.
**saw log,** دارێکە ئەوەندە زلە ببڕێتەوە و بکرێ بە تەختەدار.
**saw-mill** (sô'mil'), ***n.*** (١) کارگەی مشارکاری؛ فابریقەی دار بڕینەوە
بۆ کردنی بە تەختەدار. (٢) مەکینەی مشارکاری.
**sawn** (sôn), *alternative past participle of* **saw.**
**saw-toothed** (sô'tōōtht'), ***adj.*** دەنووك مشاری
**sawyer** (sô'yēr), ***n.*** (١) داربڕەوە بە مشار؛ مشارکەر.
(٢) قالۆنچەیەکە کرمۆکەکەی کون دەکاتە داری زیندوو و مردووەوە دەیخواتەوە.
**sax** (saks), ***n.*** [Colloq.]. = **saxaphone.**
**saxatile** (sak'sə-til), ***adj.*** = **saxicoline.**
**saxhorn** (saks'hôrn'), ***n.*** ساکسهۆڕن: ئامێرێکی مۆسیقییە
لە بابەتی زوڕنا
**saxicoline** (sak-sik'ə-līn', sak-sik'ə-lin), ***adj.*** لەسەر بەرد
دەڕوێت؛ بەردنشین (زیندەوەرزانی)
**saxicolous** (sak-sik'ə-ləs), ***adj.*** = **saxicoline.**

**saxifrage** (sak'si-frij), ***n.*** ڕووەکێکی بچووکی گوڵ ڕەنگاوڕەنگە
لە دەوروپشت و لەسەر بەرد دەڕوێت و گەڵاکانی بە تۆپەڵ لە بنەکەیدا دەڕوێن.
**Saxon** (sak's'n), ***n.*** (١) ساکسۆنی: ئەندامی خێڵێکی ئەڵمانییە کە لە
سەدەی پێنجەم و شەشەمی پاش زایندا لەگەڵ " ئانگلزەکان " و " جووتەکان "
ئینگلتەرەیان داگیرکرد و ئەم ئینگلتەرەیەی ئێستایان پێکهێنا.
(٢) کەسێکی ئەنگلۆساکسۆنی.
(٣) هاوڵاتییەکی ناوچەی ساکسۆنیای ئەڵمانی.
(٤) زمانی ساکسۆنی کۆن. (٥) شێوەزمانی ئەڵمانی ناوچەی ساکسۆنیا.
***adj.*** (١) ساکسۆنی: تایبەتی بە ساکسۆنییەکان و زمان و کلتوورەکەیان
(٢) ئەنگلۆ- ساکسۆنی؛ ئینگلیزی.
(٣) ساکسۆنیایی: تایبەتی بە ناوچەی ساکسۆنیای ئەڵمانی.
**Saxonism** (sak's'n-iz'm), ***n.*** ووشەیەك یا ووتەیەکی ئینگلیزییە
کە سەرچاوەکەی ئەنگلۆ- ساکسۆنی بێت.
**Saxony** (sak'sə-ni), ***n.*** (١) جۆرە قوماشێکی خوری ساف و لووسە.
(٢) ڕێس یا تەنراوی ئەم قوماشە.
**saxophone** (sak'sə-fōn'), ***n.*** ساکسەفۆن: ئامێرێکی مۆسیقییە
لە بابەتی زوڕنا.
-saxophonist ***(n.).***
**saxtuba** (saks'tōō'bə, saks'tū'-bə), ***n.*** ساکستوبە:
" ساکسهۆڕن " ێکی گەورەیە (ووشەی " **saxhorn** " ببینە).
**say** (sā), ***v.t.*** (١) ووتن؛ بێژان. (٢) دەربڕین؛ قسەکردن.
(٣) بە دڵنیاییەوە ووتن:
***( I wish I could ~ when it will happen.)***
(٤) بە دەنگی بەرز ووتن؛ لەبەر ووتن؛ کردن: ***( ~ your prayers.)*** .
(٥) نزیکەی؛ بڵێ ئەوەندە:
***( He is ~ forty.; It is ~ worth a dollar.)***
(٦) وا ووتن: ***( People ~ she is a loose woman.)*** .
***v.i.*** ووتن؛ بێژان؛ ڕادەربڕین.
***n.*** (١) ووتە؛ فەرموودە؛ قسەی کەسێك؛ ووتراو.
(٢) هەلی ڕای خۆ دەربڕین: ***( You've had your ~ .)*** .
(٣) دەسەڵاتی بڕیاردان: ***( He has the ~ in this matter.)***
**go without saying,** ئاشکرایە؛ دیارە؛ ووتنی ناوێ.
**that is to say,** واتە.
**sayid; sayyid** (sä'yid), ***n.*** سەید؛ نەوەی پێغەمبەر.
**saying** (sā'iŋ), ***n.*** (١) ووتن؛ بێژان.
(٢) پەند؛ قسەی پێشینان؛ گوفتار.
**say-so** (sā'sō'), ***n.*** [Colloq.], (١) ووتەی بێ بەڵگە؛
ووتەی لامسەرلایی یا بێ بناغە. (٢) بڕیار؛ فەرمان؛ ووتە:
***( He left the hospital on the ~ of his doctor.)***
(٣) ماف یا دەسەڵاتی دوا بڕیاردان:
***( He has the ultimate ~ on what is to be taught.)***
**scab** (skab), ***n.*** (١) قەتماغەی برین؛ بزماتە.
(٢) گەڕی مەڕومالات؛ گەڕی؛ کەچەڵی.
(٣) نەخۆشییەکی ڕووەکە لە گەڕی دەچێت.
(٤) [Slang]، کەسێکی گەڕی پیسی بۆگەن.
(٥) (ا) کرێکارێکە کە نایەوێت ببێت بە ئەندامی ڕێکخراوی کرێکاران
(ب) کرێکارێکە کە بەشداری مان گرتن ناکات.
(ج) کەسێکە کە لەجێی کرێکاری مان گرتوو کاردەکات.
***v.i.*** (١) قەتماغە بەستن. (٢) گەڕبوون.
(٣) کارکردن لەجێی کرێکاری مان گرتوو.
**scabbard** (skab'ērd), ***n.*** کێلانی خەنجەر و شیر و نێزە؛ کیف.
***v.t.*** خستنە کێلانەوە؛ خستنە کیفەوە.
**scabble** (skab''l), ***v.t.*** بەرد داتاشین یا گەڵاڵەکردن
**scabby** (skab'i), ***adj.*** (١) قەتماغە بەستن (برین)؛ قەتماغە بەستوو.
(٢) گەڕ؛ کەچەڵ؛ کرێشاوی. (٣) پیس و بۆگەن؛ نزم؛ ناپیاو.

-**scabbily** *(adv.)* ; **scabbiness** *(n.)*.
**scabies** (skā′bi-ēz´, skā′bēz), *n.* گەڕی· نەخۆشی گەڕی.
**scabietic** (skā´bi-et′ik), *adj.* گەڕ
**scabiosa** (skā´bi-ō′sə), *n.* سکابیۆزا: گونەگەڕی؛ ڕووەکێکە گوڵی ڕەنگاورەنگ دەگرێت نێرەکەکەی زۆر بەدەرەوەیە.
**scabious** (skā′bi-əs), *adj.* (١) گەڕ
(٢) لە گەڕی دەچێت: تایبەتی بە گەڕی.
**scabious** (skā′bi-əs), *n.* = **scabiosa.**
**scabrous** (skā′brəs), *adj.* (١) زبر· گرنج گرنجاوی.
(٢) ئاڵۆز؛ سەخت (کێشە)؛ پێویست بە وردی و ژیری دەکات بۆ چارەکردنی.
(٣) بێ پەردە؛ بەرەڵا (ڕەووشت)؛ هەڵماڵراو: *( a ~ novel)* .
**scad** (skad), *n.* = **saurel.**
**scads** (skadz), *n.pl.* [Colloq.], ژمارەیەکی زۆر؛ کۆمەڵێکی زۆر؛ گەلێک. *( ~ of people, money, etc.)* .
**scaffold** (skaf′'ld, skaf′ōld), *n.* (١) داربەست (خانووکاری)؛ داربەند. (٢) سێدارە؛ قەنارە.
(٣) شانۆ یا سەکۆی دارینی سەردەمی بۆ شت پیشاندان.
(٤) چوارچێوەی بەرز. (٥) کەرەسەی داربەست.
*v.t.* (١) داربەست بۆ کردن؛ داربەندکردن (خانووسازی)؛ داربەست دانان.
(٢) خستنەسەر چوارچێوە یا سەکۆی سەردەمی بۆ پیشاندان.
**scaffolding** (skaf′'l-diŋ), *n.* (١) کەرەسەی داربەست (خانووسازی).
(٢) داربەست؛ کۆمەڵە داربەست.
**scagliola** (skal-yō′lə), *n.* مەڕمەڕە درۆزنە: بەردێکە لە گەچ و تۆزی مەڕمەڕ دروست دەکرێت.
**scalable** (skāl′ə-b'l), *adj.* مرۆڤ دەتوانێ پیایدا هەڵبگەڕێ؛ پێدا هەڵگەڕانی لە توانای مرۆڤدایە.
**scalade** (skə-lād′), *n.* [Obs.], = **escalade.**
**scalage** (skāl′ij), *n.* (١) لێ داشکانی قەوارەو پانی و درێژی و نرخ (بەهۆی چوونەوەیەک یا کرژبوون و زیانی چاوەڕوان لێکراوەوە).
(٢) ڕادەی ئەم لێ داشکانە. (٣) ڕادەی لێ داشکانی دارو تەختەی خانووکاری (بەهۆی چوونەوەیەک و وشکبوونەوەوە).
**scalar** (skāl′ēr), *adj.* پلە پلەیی؛ پەیژەیی.
*n.* ڕادەی یا هەندی بە ژمارە دەربڕراو وەک قەوارەو درێژی و پلەی گەرما.
**scalare** (skə-lêr′), *n.* جۆرێکە لە ماسی.
**scalariform** (skə-lar′ə-fôrm´), *adj.* پەیژەیی؛ پلە پلەیی؛ نمرە نمرەیی
**scalawag** (skal′ə-wag´), *n.* *Also* **scallawag,** (١) ناپەسەند؛ پیس· ناڕەسەن· قومارباز (٢) گیاندارێکی گول· بچووک، یا بێ ئالیک و لاواز.
(٣) ئەندامێکی سپی حیزبی کۆماری لە ناوچەی خوارووی ئەمەریکا لە دوای شەڕی براکوژی ئەمەریکا (لەڕووی سووکییەوە).
**scald** (skôld), *v.t.* (١) داپڵۆخاندن؛ داخ کردن یا سووتاندن بە ئاوی گەرم یا هەڵم. (٢) هێنانە کوڵان. (٣) ئاوی لەکوڵ بەکارهێنان بەتایبەتی بۆ:
(ا) خاوێنکردنەوەی ئامێر لە میکرۆب.
(ب) داماڵینی پێستی میوە.
*v.i.* داپڵۆخان؛ سووتان بە ئاوی گەرم یا هەڵم.
*n.* (١) ناوچەی داپڵۆخیو؛ شوێنی بە ئاوی گەرم یا هەڵم سووتاو.
(٢) سپی بوون یا هەڵقرچانی گەڵا و شانەی ڕووەک بەهۆی کەڕوو یا گەرمای زۆرەوە.
**scald** (skôld, skäld), *n.* = **skald.**
**scalding** (skôld-iŋ), *adj.* (١) زۆر گەرم؛ لەکوڵ؛ داخ:
*( ~ water)*
(٢) سووتێنەر؛ داخکەر؛ هەڵقرچێنەر: *( the ~ sun)* .
(٣) توندوتیژ (ڕەخنە)؛ بڕ؛ بڕندە؛ تیژ: *( a series of ~ editorials)* .
**scale** (skāl), *n.* (١) (ا) پەیژە؛ پێ پلیکانە.
(ب) هۆی سەرکەوتن بۆ سەرەوە.
(٢) پلە؛ ڕیزە پلە؛ نمرە: *( the ~s of a thermometer)* .
(٣) پێوەر؛ پێوانە؛ ئامێری پلە پلە (بۆ پێوان)؛ ڕاستەی نیشانەکراو.
(٤) (ا) پێوانەی نەخشە: *( a ~ of one inch to a mile)* .
(ب) مێڵی پیشاندەری ئەم پێوانەیە.
(٥) (ا) ڕێژە. (ب) پلە.
(٦) ڕشتەی پێوانە یا ژماردنێکی پلە پلە.
(٧) هەڵگەڕان بە دیواری قەڵا یا سەنگەردا (بۆ گرتنی).
(٨) کلیلی ئاوازی مۆسیقا.
*v.t.* (١) پێدا سەرکەوتن؛ پێدا هەڵگەڕان؛ بە پەیژە پێدا سەرکەوتن.
(٢) پلە پلە کردن. (٣) پێوان.
(٤) داشکان بەپێی ڕێژەیەک یا پێوەرێکی تایبەتی:
*( Prices were ~d down five percent.)*
*v.i.* (١) پێدا هەڵگەڕان؛ پێدا سەرکەوتن. (٢) بەرزبوونەوە پلە پلە.
**on a large ( or small ) scale,** تا ڕادەیەکی زۆر یا کەم؛ بە ئەندازەیەکی زۆر یا کەم؛ لە چوارچێوەیەکی فراواندا یا تەسکدا.
**scale** (skāl), *n.* (١) پوولەکە ماسی.
(٢) پوولەکەی پێستی گیاندارە خشۆکەکان (وەک مار، تیمساح... هتد).
(٣) پوولەکەی لاق و قاچی باڵندەو باڵی جانەوەر.
(٤) توێخە پێستی وشکبووەوەی لە لەش بووەوە؛ توێک؛ کاژ.
(٥) پوولەکە.
(٦) پەردەیەکی تەنکە بەسەر کانزای ژەنگ هەڵهێناوەوە دروست دەبێت.
(٧) پوولەکە یا قەتماغەی ڕەقی ورد ورد بووی ناو کتلی و بەرمیلی ئاو گەرم کردن. (٨) گوێچکە گەڵای بچووکی دەوری خونچە.
(٩) مێرووی پوولەکەیی: ئاوی ڕووەک هەڵدەمژێت و دەیفەوتێنن.
*v.t.* (١) پوولەکە لێکردنەوە؛ ماسی پاک کردن: *( to ~ a fish)* .
(٢) داتاشین؛ داڕووشاندن؛ توێ توێ کردن؛ کڕاندن.
*v.i.* (١) توێک فڕێدان؛ توێخ لێ بوونەوە:
*( The paint is ~ing off that old house.)*
(٢) بە پوولەکە داپۆشران.
**scale** (skāl), *n.* (١) تای تەرازوو. (٢) *(pl.)* ، تەرازوو.
*v.t.* (١) کێشان (بە تەرازوو). (٢) قورسایی یا کێشی ئەوەندە بوون
(٣) تاوتوێ کردن؛ بەراووردکردن؛ هاوتا یا هاوسەنگ کردن.
*v.i.* کێشران.
**the scales,** بورجی تەرازوو (ئەستێرەوانی).
**turn the scales,** بڕیاردان؛ خستن بە لایەکدا.
**scale insect,** مێرووی پوولەکەیی: مێروویەکی بچووکە ئاوی ڕووەک هەڵدەمژێت و دەیفەوتێنێت.
**scalene** (skā-lēn′), *adj.* (١) لا جیاواز (گۆشە)
(٢) تایبەتی بە ماسولکەی نێوان بڕبڕەی پشت و دوو پەراسووی سەرەوە.
**scalepan** (skāl-pan), *n.* تاتەرازوو.
**scaler** (skāl′ēr), *n.* ژمێرەری ئەلەکترۆنی
**scaling ladder,** پەیژەی هەڵگەڕان بە دیواری قەڵا و سەنگەر و شوێنی سەختدا.
**scall** (skôl), *n.* *Also* **scald,** کەچەڵی؛ توێکی پێست فڕێدان.
**scallawag** (skal′ə-wag´), *n.* = **scalawag.**
**scallion** (skal′yən), *n.* تەرەپیاز.
**scallop** (skäl′əp, skal′əp), *n.* (١) جۆرێکە لە گوێچکەماسی قاقلە باوەشێنی. (٢) گۆشتی ئەم گوێچکەماسییە.
(٣) پەڕەکانی قاقلەی ئەم گوێچکەماسییە (کە گەورەکانیان بۆ چێشت لێنان لە فڕندا بەکاردەهێنرێن).
(٤) چوکلەی قەراغی گرنج گرنجی نەقش و نیگاری جل وبەرگ.
*v.t.* (١) قەراغ بڕین بە گرنج گرنجی.
(٢) ماسی و خواردەمەنی تر لێنان لە فڕندا هەتا جوان سووردەبێتەوە.
**scallywag** (skal′i-wag´), *n.* = **scalawag.**
**scalp** (skalp), *n.* (١) بێخی سەر؛ چەرمی سەر؛ بێخ.

(۲) پارچەیەك چەرمی سەری دوژمن كە هیندییەكانی ئەمەریكا هەڵیاندەواسی وەك نیشانەو یادگاری سەركەوتن بەسەر دوژمنەكەیاندا

(۳) نیشانەی سەركەوتن؛ یادگاری سەركەوتن.

(٤) [Colloq.]. قازانجێكی كەمە لە كڕین و فرۆشتنەوەی بلیت و شتی وەهادا دەست دەكەوێت

*v.t.* (۱) چەرمی سەر گرتنەوە.

(۲) ساختەلێكردن؛ دەستبڕین؛ ڕووتكردنەوە

(۳) [Colloq.]. كڕین و فرۆشتنەوەی شتومەك بۆ قازانجێكی كەم و خێرا.

(٤) [Colloq.]. كڕین و فرۆشتنەوەی بلیتی یاری و شانۆخانە بۆ قازانج لە بازاڕی ڕەشدا.

*v.i.* [Colloq.]. كڕین و فرۆشتنەوەی بلیتی یاری و شانۆخانە لە بازاڕی ڕەشدا بۆ قازانجی خێرا

**scalpel** (skal′pəl), *n.* چەقۆی نەشتەرگەر.

**scalper** (skal′pēr), *n.* [Colloq.]. كەسێكە كە بلیتی شانۆخانەو یاری بە هەرزان دەكڕێت و بەگران دەیان فرۆشێتەوە لە بازاڕی ڕەشدا.

**scalp lock,** كاكۆڵێكە هەندێ هیندی ئەمەریكایی بە تەوقەسەرە تاشراوەكەیانەوە دەیهێڵنەوە لە ڕقی دوژمن

**scaly** (skāl′i), *adj.* (۱) پوولەكەدار؛ پوولەكاوی؛ بە پوولەكە داپۆشراو (وەك پێستی ماسی). (۲) توێك فڕێدەر؛ توێخ لێ بووەوە؛ كرێشاوی؛ كرێش هەڵهێناو. (۳) مێرووی پوولەكەیی تێی داوە (ڕووەكناسی).

(٤) [Slang]. بێ نرخ؛ پیس و بۆگەن (مرۆڤ)

**scaly anteater,** = pangolin.

**scammony** (skam′ə-ni), *n.* (۱) ڕووەكێكی خۆهەڵواسی گەڵا تیری گوڵ سپییە (۲) جەوی ڕەگی ئەم ڕووەكە (بۆ ڕەوانی بەكاردەهێنرێت)

**scamp** (skamp), *n.* (۱) كەسێكی بێ نرخی سەرسەری؛ كەسێكی ناپەسەندی بەدكار

(۲) منداڵێكی قوماربازی شەیتان؛ لاوێكی كەتن بازی بە گوبەن

**-scampish** *(adj.).*

**scamp** (skamp), *v.t.* بە لامسەرلایی و بێباكانە كردن.

**-scamper** *(n.).*

**scamper** (skam′pēr), *v.i.* بە پەلەپرووزێ ڕۆیشتن؛ بە پەلە ڕۆیشتن؛ ڕاكردن؛ تێ تەقاندن.

*n.* ڕۆیشتنی پەلە؛ ڕاكردن؛ تێ تەقان؛ ڕۆیشتنی پەلەپرووزێ.

**scampi** (skam′pi), *n.* كوڵلەی دەریایی گەورە

**scan** (skan), *v.t.* (۱) شیكردنەوەی دێڕی هەڵبەست بەپێی كێشەكەی.

(۲) بە دەنگی بەرز هۆنراوە خوێندنەوە بۆ دۆزینەوەی كێشەكەی.

(۳) لێ ووردبوونەوە (لە ناوچەیەكی بچووك).

(٤) چاوگێڕان بە پەلە بە ناوچەیەكی گەورەدا لەمسەر بۆ ئەوسەر.

(٥) (ا) بە شەوقی ئەلەكترۆنی پێداگەڕان بۆ وێنەگرتن یا ناردنی وێنەیەك (تەلەفزیۆن). (ب) بە ڕادار بۆ شتێك گەڕان.

(ج) گەڕان بە شریتی موگناتیساوی یا كارتی تایبەتیدا بۆ زانیاری تایبەتی.

(٦) چاوپیاخشاندن؛ بە پەلە خوێندنەوە؛ پەڕە پەڕە كردن

*v.i.* (۱) شیكردنەوەی دێڕی هەڵبەست بەپێی كێشەكەی.

(۲) گونجانی دێڕی هەڵبەست لەگەڵ كێشێكی تایبەتیدا.

(۳) خوێنرانەوە بە تیشكی ئەلەكترۆنی.

*n.* (۱) لێ ووردبوونەوە؛ تێ نواڕین. (۲) بینایی؛ مەودای بینایی.

**scandal** (skan′d'l), *n.* (۱) كردەوەی نابڕووبەر؛ كاری ناوزڕێن؛ مرۆڤی نابڕووبەر (۲) نابڕووچوون؛ ڕیسوایی؛ شەرمەزاری؛ ڕیسوابوون؛ حەیاچوون (۳) بەدگۆیی؛ لەپاش ملە بە خراپە باس كردن؛ ناو پیس كردن.

(٤) كەسێكی ڕیسوا یا نابڕووچوو.

*v.t.* (۱) بەدگۆیی كردن؛ ناو پیس كردن

(۲) [Obs.]. scandalize

**scandalize** (skan′d'l-īz′), *v.t.* (۱) دڵ داخوڕپاندن یا واق ووڕماندن بە كردەوەی ناشرین و ناپەسەند (۲) [Archaic]. ناو پیس كردن؛ نابڕووبردن؛ ڕیسوا كردن.

**scandal-monger** (skan′d'l-muŋ′gēr), *n.* كەسێكە كە قاری خراپ دەخاتەوەو ناوی خەڵك پیس دەكات؛ بەدگۆ؛ نابڕووبەر.

**scandalous** (skan′d'l-əs), *adj.* (۱) نابڕووبەر؛ ڕیسواكەر؛ ناشرین؛ حەیابەر: *( her ~ behavior)* .

(۲) بوختانی: بریتییە لە ووت‌ووا‌تی نابڕووبەر: *( ~ rumor)*

(۳) حەز لە بوختان كەر؛ حەز لە دەنگوباسی نابڕووبەر كەر.

**scandal sheet,** ڕۆژنامەی نابڕووبەر: ڕۆژنامە یا گۆڤارێكە كە هەمیشە دەنگوباسی نابڕووبەرو بوختانی و ناو پیسكەر بڵاودەكاتەوە.

**scandent** (skan′dənt), *adj.* خۆهەڵواسەر (ڕووەك): *( a ~ vine)* .

**scandian** (skan′di-ən), *adj.* ئەسكەندیناڤی

**Scandinavian** (skan′də-nā′vi-ən), *adj.* ئەسكەندیناڤی (گەل، زمان، كلتور...هتد).

*n.* (۱) كەسێكی ئەسكەندیناڤی؛ ئەسكەندیناڤییەك.

(۲) زمانە ئەسكەندیناڤییەكان (كە بەشێكن لە زمانە ئەڵمانییەكانی سەروو).

**scandium** (skan′di-əm), *n.* سكاندیۆم: توخمێكی كانزایی سووكی ڕەنگ زیوییە.

**scanner** (skan′ēr), *n.* (۱) پشكنەر (مرۆڤ، ئامێر).

(۲) ئامێری پشكنینی لەش (پزیشكەوانی).

(۳) ئامێری ئەلەكترۆنی خوێنەرەوەو نێرەر.

**scanning** (skan′iŋ), *n.* پشكنین و دۆزینەوەو بڵاوكردنەوەی دەنگ و وێنە بە ئامێری ئەلەكترۆنی (ڕادیۆو تەلەفزیۆن).

**scansion** (skan′shən), *n.* شیكردنەوە یا بەش بەش كردنی هۆنراوە بەپێی كێشەكانی.

**scansorial** (skan-sôr′i-əl), *adj.* (۱) بۆ پیاهەڵگەڕان كراوە یا دەشێت (وەك قاچی باڵندە). (۲) پیاهەڵگەڕاو؛ توانای پیاهەڵگەڕانی هەیە

**scant** (skant), *adj.* (۱) كەم؛ بەش ناكات؛ نەختێك؛ كز.

(۲) نەختێك كەمتر لە: *( a ~ these miles)* .

(۳) كەم پێ مان؛ پێ نەمان: *( ~ of breath)* .

*v.t.* (۱) ڕەزیلی لەگەڵ كردن؛ بەرچاوتەنگی كردن؛ پیسكەیی نوواندن؛ ئەوەندە پێ نەدان. (۲) سنوور بۆ دانان؛ كەم پێدان. (۳) كەمكردنەوە

(٤) گوێ پێ نەدان و ڕێز لێ نەگرتن؛ سەرنج پێ نەدان؛ بە هیچ دانەنان.

scant of, كەم پێ بوون؛ ئەوەندە پێ نەمان.

**-scantly** *(adv.)* ; **scantness** *(n.).*

**scantily** (skan′t'l-i), *adv.* كەم؛ بە ناتەواوی؛ بە ئاستەم: *( She was ~ dressed.)*

**scantling** (skant′liŋ), *n.* (۱) كەم؛ هەندێك یا بڕێكی كەم.

(۲) پانی و درێژی كەرەسەی خانوو (وەك خشت و بەرد و دار و تەختە).

(۳) پارچەیەك داری بچووكی خانوو؛ دەستەك.

(٤) دیرەك؛ كۆڵەكەی بارێك.

**scanty** (skan′t), *adj.* (۱) كەم؛ بە ئاستەم بەش دەكات.

(۲) بەش ناكات؛ زۆر كەم؛ بچووك؛ ناتەواو: *( a ~ crop of rice; a ~ dress)*

**-scantiness** *(n.).*

**scape** (skāp), *n.* (۱) لاسكە گوڵێكی ڕووتە كە یەكسەر لە ڕەگەكەوە لە زەوییەوە هاتبێتە دەرەوە وەك چاران چەقیلەو گوڵاڵە.

(۲) قەفی پەڕی باڵندە. (۳) قەدی كۆڵەكەو پایە.

**'scape; scape** (skāp), *n.*, *v.t. & v.i.* [Archaic], = **escape.**

**scapegoat** (skāp′gōt′), *n.* (۱) بزنی گوناه خراوە مل (تەورات و ئینجیل)؛ بزنی قوربانی (بۆ بەلا گێڕانەوە)؛ بزنی تاوان هەڵگر.

(۲) قۆچی قوربانی: كەسێكە كە تاوان و لۆمەو بەدكاری كەسێكی تر یا كۆمەڵێكی دەخرێتە مل.

**scape-grace** (skāp′grās′), *n.* كەسێكی بێ نامووسی بەدڕەفتار.

**scaphoid** (skaf′oid), *adj.* بەلەمی؛ لە بەلەم چوو (بەتایبەتی ئێسقانی مەچەك و قولەقاچ).

*n.* ئێسقانی بەلەمی.

**scapolite** (skap′ə-līt′), *n.* سکاپۆلیت: سلیکاتی ئەلەمنیۆم؛ کالسیۆمی شەوقدار.

**scapose** (skā′pōs), *adj.* (١) لاسکی رووتی یەکسەر لە زەوییەوە دەرهاتووە دەگرێت (وەك گوڵاڵەو چاران چەقیلە) (٢) لەم لاسکە رووتە دەچێت. (٣) لە لاسکێکی رووتی وەها پێکهاتوو.

**scapula** (skap′yoo-lə), *n.* دەفەی شان (پێشی دەوروتری: " shoulder blade ").

**scapular** (skap′yoo-lēr), *adj.* تایبەتی بە دەفەی شان.

*n.* (١) کراس یا چاکەتێکی بێ باڵی دەڵبی ووشکەسۆفییە. (٢) دوو پارچە قوماشی بچووکی بە بەن پێکەوە بەستراون لەژێر جلەوە لەبەردەکرێن بەسەر سنگو پشتەوە لەلایەن هەندێ کاسۆلیکەوە وەك نیشانەی لە خواترسی (٣) (ا) scapula (ب) پەری سەرشانی باڵندە. (٤) سارغی سەرشان ( نەشتەرکاری).

**scapulary** (skap′yoo-ler′i), *n. & adj.* = scapular.

**scar** (skär), *n.* (١) جێ برین؛ جێ نیشانەی برین، سووتاوی یا برین؛ جێی کۆنە برین؛ بزماتە. (٢) جێ نیشانەی گەڵاولق لە دارو درەخت کردنەوە؛ بریندارى دوای ئەم لێکردنەوەیە. (٣) (ا) پاشماوەی ئازاری هەستیو داخو خەفەت لە مێشكو دەروونداٍ پاشماوەی برینو سووتانی هەستی. (ب) نیشانەی بەردەوامی داخوخەفەتو ناخۆشی (وەك چرچولۆچی ناوچەوان).

*v.t.* (١) بریندارکردن بە جۆرێك جێ نیشانەکەی هەر بمێنێ؛ داخ کردن. (٢) ئازاردان بە جۆرێك لە بیری نەچێتەوە؛ ئازارێکی هەستی وا دان کە نیشانەکەی هەربمێنێ: *( The rape ~red her for life.)*

*v.i.* نیشانەی برین، سووتاوی، یا برین پێوەمانەوە؛ جێی برین یا سووتاوی پێوە دیاربوون.

**scar** (skär), *n.* (١) قەد شاخی بەردانی؛ کەندەڵانی بەردین؛ لێژایی بەردین. (٢) بەردی سەردەرهێناوی ناو دەریا.

**scarab** (skar′əb), *n.* (١) قالۆنچە رەشە: کەڵە قالۆنچەیەکی باڵدارە میسرییە کۆنەکان بە پیرۆزیان دادەنا. (٢) گەوهەرێك یا خشتێك کە وێنەی ئەم قالۆنچەیەی لەسەر هەڵکەنرابێ (بۆ جوانی یا نوشتە).

**scarabaean** (skar′ə-bē′ən), *n. & adj.* = scarabaeid.

**scarabaeid** (skar′ə-bē′id), *adj.* قالۆنچەیی: هی توخمی قالۆنچە.

*n.* قالۆنچە (کە گەلێك جۆر دەگرێتەوە وەك قالۆنچە رەشەو گووخلێنکەو قالۆنچە یابانی هتد).

**scarabaeoid** (skar′ə-bē′oid), *adj.* = scarabaeid.

**scarabaeus** (skar′ə-bē′əs), *n.* = scarab.

**scaraboid** (skar′ə-boid′), *adj.* قالۆنچەیی

**scaramouch** (skar′ə-mouch′), *n.* ترسنۆکێکی فشەچی؛ کەسێکی بەدکاری خۆهەڵکێش.

**scarce** (skârs), *adj.* (١) کەم؛ بەش ناکات؛ کز؛ قات: *( Vegetables are ~ in winter.)*

(٢) دەگمەن؛ دانسقە

make oneself scarce, [Colloq.], خۆ کەم دەرخستن؛ خۆ پیشان نەدان؛ خۆ دوورخستنەوە لە خەڵك.

-scarceness *(n.).*

**scarcely** (skârs′li), *adv.* (١) بە ئاستەم؛ بە حاڵ. (٢) بە دەگمەن؛ بەگران: *( He can ~ write a paragraph.)*. (٣) وانییە؛ نەء: *( That's ~ true.)*

**scarcement** (skârs′mənt), *n.* رەفەی دیوار یا قەد شاخ.

**scarcity** (skâr′sə-ti), *n.* (١) کەمی؛ کەمێتی؛ کزی؛ بەش نەکردن؛ قاتی؛ قاتوقڕی: *( the ~ of food and medicine)*. (٢) دانسقەیی؛ دەگمەنی؛ کەم ڕوودان.

**scare** (skâr), *v.t.* (١) ترساندن؛ تۆقاندن (٢) [ ~ away ; ~ off ]، ترس خستنەبەر؛ ترساندنو ڕاونان:

[ *The dog ~d the thief away* ( or off ) .]

*v.i.* ترسان؛ تۆقین؛ ترس نیشتنەبەر.

*n.* ترس؛ ترسێکی گشتی: *( a war ~ )* .

**scarecrow** (skâr′krō′), *n.* (١) داهۆڵ. (٢) ترسی بۆش؛ شتێکە کە هەر بە شێوە ترسناك بێ بەڵام لە ڕاستیدا وانەبێ. (٣) کەسێکی لاوازی جلی کۆنەو شڕوور لەبەر.

**scarehead** (skâr′hed′), *n.* [Colloq.], سەرووتاری گەورەو وورووژێنەری ڕۆژنامە.

**scaremonger** (skâr′muŋ′gēr), *n.* کەسێکە کە قاوی ترسناك دەخاتەوە؛ کەسێکی دەم بە هاوار؛ ترس خەرەوە.

**scarf** (skärf), *n.* (١) ملپێچ؛ لەچك؛ سرکەیی؛ ملبەند. (٢) سەرمێزی بارێك.

*v.t.* ملپێچ لە مل کردن؛ لەچك کردنەسەر.

**scarf-skin** (skärf′skin′), *n.* توێکی پێست؛ ڕووی پێست؛ توێژاڵی سەرووی پێست.

**scarify** (skär′ə-fī′), *v.t.* (١) ڕووشاندنی پێست (وەك لە کوتاندا)؛ بە ئاستەم هەڵدڕینی یا هەڵتلیشانی پێست (نەشتەرکاری). (٢) بە توندی ڕەخنەلێگرتن؛ هێرشی توندوتیژ بردنەسەر. (٣) هەڵگێڕانەوەی زەوی؛ کێڵان. (٤) پێستی تۆو هەڵدڕین بۆ زوو چەکەرەکردن یا ڕووان.

-scarifier *(n.)* ; scarification *(n.).*

**scarious** (skär′i-əs), *adj.* تەنكو پێست ئاسایی و ووشك:

*( ~ bracts)*

**scarlatina** (skär′lə-tē′nə), *n.* = scarlet fever.

**scarlatinoid** (skär-lat′ə-noid′), *adj.* سوورەتایی؛ لە سوورەتا دەچێت.

**scarlet** (skär′lit), *n.* (١) ڕەنگی ئاڵ؛ ئاڵ؛ سوورئاڵ؛ سووری گەش. (٢) قوماش یا جلوبەرگی ئاڵ.

*adj.* (١) ئاڵ؛ سوورئاڵ؛ سووری گەش. (٢) قەحبەیی؛ سووك؛ داوێن پیسی.

**scarlet fever,** سوورەتا: نەخۆشییەکی درمە دەبێتە هۆی ئاوسانی گەروو و پەیدابوونی پەڵەی سوور لەسەر پێست.

**scarlet letter,** تیپە سوورە: تیپێکی ئاڵە لە کۆندا ژنی زیناکەرو‌قەحبە دەبوایە بەسەر جلەکانیانەوە لەبەریان بکردایە.

**scarlet runner,** لۆبیای ئاڵ (گوڵەکەی ئاڵە).

**scarlet woman,** قەحبە؛ ئافرەتی داوێن پیس.

**scarp** (skärp), *n.* (١) لێژایی؛ لێژگە؛ قەدپاڵ؛ کەندەڵان (٢) لێژگەی دەورووپشتی سەنگەر؛ دیواری ناوەوەی خەنەق.

*v.t.* (١) لێژکردن؛ قەدپاڵ دروستکردن؛ وەك کەندەڵان لێکردن. (٢) کەندەڵان بە دەورووپشتدا دروستکردن.

**scar tissue,** بزماتە؛ شوێن برینی گۆشتەوزوون هێناوە.

**scary** (skâr′i), *adj.* [Colloq.], (١) ترسناك؛ سامناك؛ پڕ مەترسی. (٢) ترسنۆك.

**scat** (skat), *n.* مۆڵکانە؛ باجی زەوی‌وزار.

**scat** (skat), *v.i.* [Colloq.], بڕۆ! ؛ لاچۆ لێرە! ؛ ڕۆیشتن.

**scat** (skat), *n.* گۆرانی جازی بێ مانا.

*v.i.* گۆرانی جازی بێ مانا ووتن.

**scat** (skat), *n.* جۆرە ماسییەکی ڕووباری پانکەڵە، خڕ، خاڵ خاڵ، یا بەڵەکە (بەتایبەتی بۆ جوانی لە حەوزو پیشانگادا دادەنرێ).

**scat** (skat), *n.* پیسایی یا پشقڵی گیاندار (بەتایبەتی گیانداری کێوی ڕاو).

**scathe** (skāth), *v.t.* [Archaic of Dial.], (١) سووتاندن؛ داخ کردن؛ ئازاردان؛ بریندارکردن. (٢) بە توندی ڕەخنەلێگرتن؛ بە توندی سەرزەنشتکردن

*n.* [Archaic of Dial.], ئازاردان؛ سووتان؛ داخ کردن؛ ئازار.

**scathing** (skāth′iŋ), *adj.* توندوتیژ؛ بڕ؛ بڕندە:

*( a ~ article ; ~ remarks, criticism, etc.)*

**scato-** (skat′ō, skat′ə), پێشگرێکە بەمانای: گوو؛ پیسایی:

*( scatology)*

**scatology** (skə-tol′ə-ji), *n.* (١) گووناسی؛ لێکۆڵینەوەی گوو.

(۲) (أ) حولیابوونی گووو گووکردن
(ب) چارەکردنی ئەم نەخۆشی خولیایییە (دەروونناسی).
(۳) زۆر نووسین یا دووان لەسەر باسی پیس و بێ پەردە لە وێژەدا
**-scatological ; scatologic** *(adj.)* **; scatologist** *(n.)*.
**scatophogus** (skat′ə-fə-gəs´), *adj.* شباکەخور ،وەك گوو خانیکە؛ پشقل خۆر
**scatter** (skat′ẽr), *v.t.* (۱) (أ) پرژاندن؛ تۆودان.
(ب) ل هەلپرژاندن؛ بیژاندنەوە (۲) پرش و بڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ بڵاوەپێکردن؛ پەرەوازەکردن؛ پەخشکردن (۳) بەفیڕۆدان
(٤) شکاندنەوە (تیشک، گەرد)؛ دانەوە (فیزیا)
*v.i.* پەرش و بڵاوبوونەوە؛ بڵاوبوونەوە؛ بڵاوەلێکردن؛ پەرەوازەبوون:
*( The crowd ~ed.)*
*n.* (۱) پەرش و بڵاوبوونەوە؛ پەرەوازەبوون؛ پەرت و بڵاوکردنەوە.
(۲) ئەوەی پەرت و بڵاو دەکرێتەوە یا پەرەوازە دەبێت.
**scatterbrain** (skat′ẽr-brān´), *n.* کەسێکی بیر لە لای خۆ نەبوو؛ دالفەجی؛ ئادەمیزادی بیربڵاو
**scatterbrained** (skat′ẽr-brānd´), *adj.* بێ هۆش؛ بیربڵاو؛ دالفەجی
**scattered** (skat′ẽrd´), *adj.* پەرش؛ پرش و بڵاو؛ پەخش
**scattergood** (skat′ẽr-good´), *n.* کەسێکی پارە بەفیڕۆدەر؛ کەسێکی دەستبڵاو.
**scattering** (skat′ẽr-iŋ), *n.* (۱) (أ) پەرش و بڵاوکردنەوە
(ب) پەرش بوونەوە؛ پرش و بڵاوبوونەوە (۲) پەرش و بڵاوی؛ پرشی.
(۳) پەرش بوونەوەی ڕووناکی (فیزیا)
*adj.* پەرش وبڵاو؛ پرش؛ پەخش
**scatter rug,** بەڕە یا فەرشی بچووك (بۆ ڕاخستن لە شوێنێکی بچووکی بەتالی ماڵدا؛ پێشی دەوترێ " **throw rug** ").
**scaup** (skôp), *n.* جۆرە مراوییەکی پەڕ ڕەش و سپییە
**scavenge** (skav′inj), *v.t.* (۱) گسکدان (کوڵان و شەقام)؛ پاك کردنەوە
(۲) مووشەکردن؛ گەڕان بۆ خواردن لە بەرماوەی فڕێدراودا.
(۳) بۆ شتی بەکەڵك هاتوو گەڕان لەناو کۆمەڵە شتی فڕێدراودا.
(٤) لابردنی گازی سووتاو لە مەکینەی سووتانی ناوەکی
(۵) پاك کردنەوەی کانزای تواوە (کانزاناسی)
*v.i.* مووشەکردن؛ بۆ خواردن گەڕان لەناو بەرماوەی فڕێدراودا؛ چڵکاوخواردن؛ گەنکەخواردن؛ گیانەوەری مردارەوەبوو خواردن
**scavenger** (skav′in-jẽr), *n.* (۱) زبڵڕێژ؛ خۆڵکێش؛ خۆڵڕێژ
(۲) گیاندار یا باڵندەی مردارەوەبووخۆر؛ گیانداری گەنکەخۆر؛ گەندەخۆر
(۳) چڵکاوخۆر؛ مووشەکەر؛ بەرماوەخۆر؛ گەنکەخۆر
(٤) ماددەی پاککەرەوە (کیمیا)
**scenario** (si-nâr′i-ō´, si-nä′ri-ō´), *n.* سیناریۆ (أ) کورتەی چیرۆکی شانۆنامە یا ئۆپەرایەك (ب) کورتەی چیرۆکی فیلمی سینەما؛ نەخشەی فیلمی سینەما (ج) کورتەی زنجیرەی ڕووداوی گریمانەیی؛ نەخشەی زنجیرە ڕووداوی هێشتا ڕوونەداو.
**scenarist** (si-nâr′ist, si-nä′rist), *n.* نووسەری نەخشە یا کورتەی چیرۆکی فیلمی سینەما
**scend** (send), *n.* بەرزبوونەوەی کەشتی بە شەپۆل؛ پاڵی شەپۆل.
*v.i.* بەرزبوونەوەی کەشتی بە شەپۆل؛ پاڵنانی شەپۆل
**scene** (sēn), *n.* (۱) جێی ڕوودانێك؛ شوێنی ڕوودانی شتێك:
*( the ~ of the crime)*
(۲) شوێنی ڕوودان (ڕووداوەکانی شانۆنامە، ئۆپەرا، یا فیلمێکی سینەما):
*( The ~ of "Hamlet" is Denmark.)*
(۳) پەردە (شانۆنامە)؛ دیمەن (شانۆگەری)
(٤) بەشێکی شانۆنامە، فیلم، یا چیرۆك
(۵) دیمەن و کەرەسەی دەورووپشت و ناو شوێنی ڕووداوی بەشێکی شانۆنامە، ئۆپەرا، یا فیلم. (٦) دیمەن؛ وێنە.
(۷) هەڵچوون یا تووڕەبوون لەبەرچاوی خەڵك؛ تەقینەوە؛ هەستی بەتین پیشاندان: *( He made a ~ before the guests.; to make a ~ )*.
(۸) [Obs.]، شانۆ
**behind the scenes,** بە نهێنی؛ بە دزییەوە.
**scenery** (sēn′ẽr-i), *n* (۱) دیمەن و وێنەی دەورووپشتی شوێنی ڕووداوی بەشێکی شانۆنامە، ئۆپەرا، فیلم. (۲) دیمەن یا وێنەی دەشت و دەر.
**scenic** (sé′nik, sen′ik), *adj.* (۱) (أ) شانۆیی؛ هی نوواندن یا خۆدەرخستن. (ب) هی دیمەنی دەورووپشت و سەر شانۆ.
(۲) جوان (دیمەن، ڕێگە)؛ دڵگیر؛ دیمەنی جوان: *( a ~ route)*
**scent** (sent), *v.t.* (۱) بۆن کردن.
(۲) وا هەستکردن؛ بۆن کردن (مەجاز).
(۳) بۆنی خۆش لێ هاتن؛ پڕکردن لە بۆنی خۆش.
*v.i.* شوێنی بۆن کەوتن (ڕاو).
*n.* (۱) بۆن؛ بۆنی تیژ. (۲) هەستی بۆن کردن.
(۳) بۆنی خۆش؛ گوڵاو؛ بۆن وبەرامە.
(٤) بۆن؛ بۆنی گیاندارێکە کە لەدوای خۆیەوە جێی دەهێڵێت و تانجی و سەگی ڕاو بەهۆیەوە شوێنی دەکەون.
(۵) شوێن بۆن یا شوێنەوار (ڕاو)
(٦) توانایەکی تایبەتییە بۆ دۆزینەوەو پێزانینی شت؛ توانای بۆن کردن (مەجاز): *( a ~ for news)*.
**scented** (sent′id′), *adj.* (۱) هەستی بۆن کردنی هەیە
(۲) بۆنی خۆشدار. (۳) بۆندار.
**scentless** (sent-lis), *adj.* بێ بۆن: *( ~ flowers)*.
**scepter; sceptre** (sep′tẽr), *n.* (۱) گورزی شا؛ گورزی پاشایی.
(۲) دەسەڵاتی پاشایی.
*v.t.* دەسەڵاتی پاشایی پێدان
**sceptic** (skep′tik), *n. & adj.* = **skeptic.**
**scepticism** (skep′tə-siz′m), *n.* **skepticism.**
**sceptre** (sep′tẽr), *n. & v.t.* [British spelling], = **scepter.**
**schedule** (skej′ool), *n.* (۱) خشتە؛ لیستە.
(۲) خشتەی کات (بەتایبەتی هی هاتن وچوونی شەمەندەفەر و پاس و فڕۆکە).
(۳) بەرنامە؛ بەرنامەی کار و کاتی جێبەجێکردنی
*v.t.* (۱) خشتە ئامادەکردن؛ لیستە گرتن. (۲) خستنە ناو خشتەوە.
(۳) کاتی تایبەتی بۆ دانان: *( His speech is ~d for next Monday.)*
**schema** (skē′mə), *n.* نەخشە؛ وێنەی پیشاندەر
**schematic** (skē-mat′ik), *adj.* نەخشەیی؛ هی ڕەنگ ڕشتن؛ هی نەخشەکێشی.
**-schematically** *(adv.)*.
**schematism** (skē′mə-tiz′m), *n.* نەخشە؛ شێوە یا بنچینەی نەخشەکێشی.
**schematize** (skē′mə-tīz´), *v.i. & v.t.* نەخشەکێشان؛ ڕێکخستن بەپێی نەخشەیەك.
**-schematization** *(n.)*.
**scheme** (skēm), *n.* (۱) نەخشە؛ ڕێ دانان.
(۲) ڕێکخستنێك؛ پەیڕەو؛ جۆری لێکدان و ڕێکخستن: *( a color ~ )*.
(۳) پیلان؛ داو؛ نەخشەی نهێنی و ناپەسەند: *( a ~ to steal money)*
(٤) نەخشە یا پرۆژەی گریمانەیی. (۵) وێنەی پیشاندەری ئەستێرەوانی
*v.t.* (۱) نەخشەکێشان؛ نەخشەکردن؛ ڕێ دانان.
(۲) پیلان گێڕان؛ نەخشەی نهێنی و ناپەسەند کێشان؛ داونانەوە؛ پیلان دانان
*( They ~d the bank robbery together.)*
*v.i.* (۱) نەخشەکێشان؛ نەخشەکردن؛ ڕێ دانان.
(۲) پیلان گێڕان؛ پیلان دانان:
*( They ~d to overthrow the government.)*
**schemer** (skēm′ẽr), *n.* پیلانگێڕ؛ پیلانباز؛ داونێرەرەوە؛ فێڵباز.

**scheming** (skēm′iŋ), ***adj.*** فێڵباز؛ پیلانباز؛ پیلانگێڕ؛
حەز لە داونانەوە کەر.
**schilling** (shil′iŋ), ***n.*** شلنگ. پارەی نەمسایە.
**schipperke** (skip′ēr-ki), ***n.*** جۆرە سەگێکی ڕەشی بچووکی تووک
کورتی گوێ قوتی بێ کلکە.
**schism** (siz′′m), ***n.*** (١) دووبەرەکی (بەتایبەتی هی ئاینی وە لە
خاچ پەرستیدا)؛ دابەشبوونی ئاینی؛ لێکجیابوونەوە؛ بەش بەش بوون.
(٢) تاوانی دووبەرەکی خستنەوە؛ تاوانی دووبەرەکی خوازی یا دابەش کردن.
(٣) کۆمەڵێکی جیابووەوە بەهۆی دووبەرەکی‌یەوە؛ تیرە یا تاقمی ئاینی.
**schismatic** (siz-mat′ik), ***adj.*** (١) هی دووبەرەکی؛
تایبەتی بە بەش بەش بوونی ئاینی. (٢) دووبەرەکی خواز (ئاین).
***n.*** کەسێکی دووبەرەکی خواز؛ بەشداربووی دووبەرەکێتی ئاینی.
**-schismatical** ***(adj.).***
**schist** (shist), ***n.*** بەردێکی بلووری‌یە بە ئاسانی توێ توێ دەکرێت.
**schistose** (shis′tōs), ***adj.*** بە ئاسانی توێ توێ دەکرێ
(ووشەی پێشوو ببینە).
**schistosome** (shis′tə-sōm´), ***n.*** جۆرە کرمێکی خۆرەیە لە خوێنی
شیردەرو باڵندەدا دەژیو دەبێتە هۆی نەخۆشی ڕیخۆڵەو جگەر.
**schistous** (shis′təs), ***adj.*** = **schistose.**
**schizo-** (skiz′ō, skiz′ə), ***Also*** **schiz-**, پێشگرێکە بەمانای:
دووفاقە؛ دووفلیقانە؛ دووبەش؛ دووقلیش؛ تلیش: ***( schizophrenia)*** .
**schizo** (skiz′ō, skiz′ə), ***adj. & n.***, [Colloq.]. =
**schizophrenic.**
**schizocarp** (skiz′ə-kärp´), ***n.*** بەری لەت بوو (ڕووەکناسی)؛
بەری دوو کەرت بوو یا شەق بردوو.
**-schizocarpous** ***(adj.).***
**schizogenesis** (skiz´ə-jen′ə-sis), ***n.*** زاوزێی دووکەرت بوون
(زیندەوەرناسی).
**schizoid** (skiz′oid), ***n.*** کەسێکی جووت سرووشت (ڕەوانناسی)؛
مرۆڤی شیزۆفرینیایی؛ شێتەو ژیرە.
***adj.*** جووت سرووشت (ڕەوانناسی)؛ شیزۆفرینیایی؛ دووبار.
**schizomycete** (skiz´ō-mī-sēt′), ***n.*** بەکتریا؛ ووردە زیندەوەر.
**schizomycosis** (skiz´ō-mī-kō′sis), ***n.*** نەخۆشی لە بەکتریاوە
تووش بوو
**schizophrene** (skiz′ə-frēn´), ***n.*** کەسێکی جووت سرووشت
(ڕەوانناسی)؛ کەسێکی شیزۆفرینیایی؛ شێتەو ژیرە.
**schizophrenia** (skiz´ə-frē′ni-ə), ***n.*** شیزۆفرینیا؛
جووت سرووشت (ڕەوانناسی)؛ شێتەوژیرە.
**schizophrenic** (skiz´ə-fren′ik), ***adj.*** شیزۆفرینیایی؛
جووت سرووشت (ڕەوانناسی)؛ دووبار؛ شێتەو ژیرە.
***n.*** کەسێکی شیزۆفرینیایی؛ مرۆڤی جووت سرووشت (ڕەوانناسی)؛
مرۆڤی جووت کەسێتی یا دووبار.
**schizophyte** (skiz′ə-fīt´), ***n.*** بەکتریا یا ووردە زیندەوەرێکە کە
زاوزێی دووکەرتی دەکات.
**schizopod** (skiz′ə-pod´), ***n.*** گیانداری پێ قلیشدار: جۆرە
گیاندارێکی ئاوی قاقلەدارە لە کوللەی دەریا دەچێت.
***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە گیاندارە.
**schizothymia** (skiz´ə-thī′mi-ə), ***n.*** شیزۆفرینیای مام ناوەندی؛
نەخۆشی جووت سرووشتی یا کەسێتی مام ناوەندی (ڕەوانناسی)؛ گۆشەگیری.
**-schizothymic** ***(adj.).***
**schmuck** (shmuk), ***n.*** [Slang], کەسێکی کەودەنی هیچ نەزانی
لەخۆبایی کەرتڕی هیچ‌وپووچ.
**schnapper** (shnap′ēr, snap′ēr), ***n.*** = **snapper.**
**schnapps** (shnäps, shnaps), ***n.*** شناپز. (ا) خواردنەوەیەکی
سەرخۆشکەری هۆڵەندی‌یە. (ب) هەر جۆرە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری
بەتین.
**schnauzer** (shnou′zēr), ***n.*** شناوزەر: جۆرە سەگێکی ئەڵمانی لمۆز
درێژە.
**schnook** (shnōōk), ***n.*** کەسێکی ساویلکەو بێ مێشك؛
کەسێکی بە ئاسانی هەڵخەڵەتاوی خۆشباوەڕ.
**schnorrer** (shnôr′ēr), ***n.*** [Slang], سواڵکەر؛ مفتەخۆر؛ لاکوت؛
مشەخۆر.
**schnozzle** (shnoz′′l), ***n.*** [Slang], لووت؛ کەپوو
**scholar** (skol′ēr), ***n.*** (١) زانا؛ زانیار (لە هەر ڕشتەیەکدا بێ).
(٢) قوتابی‌یەکە کە یارمەتی دارایی لە دەزگایەکەوە وەردەگرێ بۆ خوێندن.
(٣) قوتابی؛ خوێندکار
(٤) خوێندەوار؛ کەسێکە کە بتوانێ بنووسێ‌و بخوێنێتەوە.
**scholarly** (skol′ēr-li), ***adj.*** (١) هی زانایان: تایبەتی بە زانیاران؛
شایستەی زانایانە. (٢) تێگەیشتوو؛ زانا؛ بزان.
(٣) زانستخواز؛ کۆششکەر.
(٤) زانایانە؛ ووردو باش لێکۆڵراوە: ***( a ~ article, journal, etc.)*** .
**-scholarliness** ***(n.).***
**scholarship** (skol′ēr-ship´), ***n.*** (١) لێکۆڵینەوەی زانستی؛
فێربوون؛ خوێندن؛ زانایی. (٢) زانیاری؛ زانست.
(٣) یارمەتی‌یەکی دارایی‌یە دەدرێت بە قوتابی لێهاتوو لەلایەن زانستگا یا
دەزگایەکی ترەوە بۆ خوێندن: ***( He has a university ~.)*** .
(٤) دەزگایەکە ئەم جۆرە یارمەتی‌یە دەدات بە قوتابی هەڵکەوتوو.
**scholastic** (skə-las′tik), ***adj.*** (١) هی قوتابی‌و قوتابخانەو زانکۆو
مامۆستاو خوێندن؛ هی پەروەردەو فێربوون؛ ئەکادیمی؛ هی زانستی:
***( ~ aptitude, activity, manners, etc.)***
(٢) تایبەتی بە زانایانی فەلسەفەو ژیربێژی سەدانی ناوەڕاست
(٣) ووشك‌و تەسك‌و بە توند گیراو.
(٤) هی قوتابخانەی ناوەندی: ***( ~ football games)*** .
***n.*** (١) قوتابی؛ زانا؛ زانیار.
(٢) زانای فەلسەفەو ژیربێژی سەدانی ناوەڕاست.
(٣) زانای ووردو ووشك‌و لە ڕادەبەدەر شت بە توندگر.
**-scholastically** ***(adv.).***
**scholasticism** (skə-las′tə-siz′m), ***n.*** فەلسەفەو ژیربێژی‌و ئاین
بەو شێوەیەی کە لە زانکۆکانی سەدانی ناوەڕاستدا دەووترایەوە.
**scholiast** (skō′li-ast´), ***n.*** شیکەرەوە یا لێکدەرەوەی کۆنی نووسراوە
کلاسیکی‌یەکان (بەتایبەتی کە تێبینی‌یەکانی لەسەر پەراوێزی پەڕتووکەکان
دەنووسی)؛ تێبینی نووس لەسەر پەراوێزی پەڕتووك بەتایبەتی هی نووسراوی
کۆن.
**-scholiastic** ***(adj.).***
**scholium** (skō′li-əm), ***n.*** (١) تێبینی پەراوێز (بەتایبەتی لەسەر
دەقی نووسراوێکی کۆنی لاتینی یا یۆنانی). (٢) تێبینی (بیرکاری).
**school** (skōōl), ***n.*** (١) (ا) قوتابخانە؛ خوێندنگا.
(ب) فێرگە: ***( a dancing ~ )*** .
(ج) زانکۆ؛ زانستگا.
(د) قوتابخانەی ئاینی‌و ژیربێژی سەدانی ناوەڕاست.
(٢) خانووو پۆل‌و تاقیگەی قوتابخانەیەك.
(٣) سەرجەمی قوتابی‌و مامۆستای قوتابخانەیەك:
***( The ~ was given a holiday.)***
(٤) وەرزی خوێندن: ***( ~ begins in September.)*** .
(٥) خوێندن؛ فێربوون: ***( He never finished ~ .)*** .
(٦) قوتابخانە (مەجاز)؛ فێرگە: ***( the ~ of hard knocks)*** .
(٧) بەشێکی زانکۆ: ***( the ~ of liberal arts)*** .
(٨) ڕێباز یا قوتابخانەیەکی بیری یا هونەری... هتد؛ پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێبازە
یا قوتابخانەیە؛ دەستە یا کۆمەڵی هاوبیر.
(٩) شێوازێکی تایبەتی ژیان: ***( a gentleman of the old ~ )*** .

*v.t.* (١) فێرکردن؛ پەروەردەکردن. (٢) مەشق پێکردن؛ ڕاهێنان.
(٣) [Archaic]. سەرزەنشتکردن.
*adj.* هی قوتابخانە؛ قوتابخانە: ***( a ~ holiday)*** .
**school** (skōōl), ***n.*** پۆلە ماسی یا گیانداری ئاوی تر (بەتایبەتی کە پێکەوە مەلە بکەن).
*v.i.* پێکەوە مەلەکردن یا خواردەمەنی خواردن (ماسی، نەهەنگ...هتد).
**school age,** (١) تەمەنی چوونە قوتابخانە
(٢) تەمەنی قوتابێتی؛ ساڵانی قوتابێتی.
**school board,** ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی قوتابخانە.
**school-book** (skōōl′book′), ***n.*** پەرتووکی قوتابخانە.
**school-boy** (skōōl′boi′), ***n.*** قوتابی کوڕ
*adj.* تایبەتی بە قوتابی کوڕ.
**school-child** (skōōl′chīld′), ***n.*** قوتابی منداڵ
**school-girl** (skōōl′gûrl′), ***n.*** قوتابی کچ
*adj.* تایبەتی بە قوتابی کچ.
**school-house** (skōōl′hous′), ***n.*** خانووی قوتابخانە
**schooling** (skōōl′iŋ), ***n.*** (١) خوێندن؛ خوێندەواری؛ چوونە قوتابخانە؛ فێربوونی قوتابخانە.
(٢) شارەزایی (کە لە کارکردنەوە هاتبێ). (٣) کرێی خوێندن
(٤) مەشق پێکردن (ئەسپ)؛ مەشق پێکردن و فێرکردن (ئەسپ و سوار).
(٥) [Archaic]. سەرزەنشت
**school-ma'am** (skōōl′mäm′), ***n.*** [Colloq.]= **school-marm.**
**school-man** (skōōl′mən), ***n.*** (١) مامۆستای فەلسەفە و ئاین و ژیربێژی زانکۆیەکی سەدەی ناوەڕاستی ئەورووپی. (٢) مامۆستا؛ زانا.
**school-marm** (skōōl′märm′), ***n.*** [Colloq.]. مامۆستای ژن (بەتایبەتی یەکێک کە بایەخ بدات بە شتی هیچ و پووچ و بە توند شت بگرێ و بە زەبروزەنگ و کۆنەپەرست بێت). (لەڕووی لاقرتێ و سووکییەوە بەکاردێت).
**school-master** (skōōl′mas′tẽr), ***n.*** (١) مامۆستا
(٢) بەڕێوەبەری قوتابخانە. (٣) سوورە ماسی.
**school-mate** (skōōl′māt′), ***n.*** هەڤاڵی قوتابخانە؛ هاوقوتابخانە.
**school-mistress** (skōōl′mis′tris), ***n.*** (١) مامۆستای ژن.
(٢) بەڕێوەبەری قوتابخانەی ژن
**school-room** (skōōl′rōōm′, skōōl′room′), ***n.*** پۆل؛ ژووری قوتابخانە
**school-teacher** (skōōl′tēch′ẽr), ***n.*** مامۆستا
**school-yard** (skōōl′yärd′), ***n.*** حەوشەی قوتابخانە.
**school-year,** ساڵی خوێندن
**schooner** (skōōn′ẽr), ***n.*** (١) کەشتی دوو ستوونی.
(٢) [Colloq.]. گالیسکەی سەرداپۆشراو.
(پێشی دەووتری: " prairie schooner ").
(٣) پەرداخی گەورەی بیرە.
**schorl** (shôrl), ***n.*** تورمالینی ڕەش بەردێکی نیمچە بەنرخە
**schottische, schottish** (shot′ish), ***n.*** (١) جۆرە سەمایەکە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**schwa** (shwä), ***n.*** شوا (دەنگناسی): (ا) دەنگی تیپە بزوێنی مێز نەخراوە سەری " ə " یە (وەک دەنگی "a" لە "ago" و "e" لە "agent" و "i" لە "sanity" دا)
(ب) نیشانەی "ə" کە نیشانەی دەنگی " ə " ە لە ئەلفوبێی دەنگناسی جیهانیدا
**sciatic** (sī-at′ik), ***adj.*** دەست و لاق و هەستە دەمارەکانیان
***( ~ pains; ~ nerve)***
**sciatica** (sī-at′i-kə), ***n.*** ئێش و ئازاری هەستە دەمارەکانی سمت و لاق.
**sciatic nerve,** هەستە دەماری سمت و لاق
**science** (sī′əns), ***n.*** (١) زانین (٢) زانیاری؛ زانست

(٣) شارەزایی (بەتایبەتی کە لەکارکردنەوە بێت)؛ کارسازی؛ پسپۆری.
(٤) چالاکییەکە کە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و ڕێبازی تایبەتی بێت.
**science fiction,** چیرۆکی زانستی خەیاڵی (بەتایبەتی کە لەسەر داهێنراوە زانستییە چاوەڕوان کراوەکانی دواڕۆژ دانرابێ).
-science-fiction ***(adj.).***
**sciential** (sī-en′shəl), ***adj.*** (١) زانیاری؛ زانستی؛ زانست لێ پەیدابوو.
(٢) شارەزا؛ کارساز؛ کارامە؛ لێهاتوو؛ بزان.
**scientific** (sī′ən-tif′ik), ***adj.*** زانستی؛ هی زانیاری:
***( ~ study, classification, analysis, etc.)***
**scientifically** (sī′ən-tif′i-k'l-i), ***adv.*** بەپێی زانست؛ لەڕووی زانیارییەوە؛ زانستانە.
**scientific method,** ڕێگای زانستی (لە لێکۆڵینەوەدا کە بریتییە لە تێبینی و تاقیکردنەوە...هتد)؛ ڕێبازی زانستی.
**scientism** (sī′ən-tiz'm), ***n.*** (١) زانایەتی: بیروباوەڕ و شێوەی کار و مەعلوومەتی زانایان. (٢) بیروباوەڕێکە دەڵێت: کە شێوەی لێکۆڵینەوەی زانستی دەتوانرێ پەیڕەوی بکرێت لە هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی نازانستیشدا (گەلێک جار لەڕووی سووکییەوە بەکاردەهێنرێت).
**scientist** (sī′ən-tist), ***n.*** زانا؛ زانیار.
**scilicet** (sil′i-set′), ***adv.*** واتا؛ واتە.
**scimitar, scimiter** (sim′ə-tẽr), ***n.*** شمشێر؛ شیری چەماوەی یەک دەم.
**scincoid** (siŋ′koid), ***adj.*** شەوگەردی.
*n.* شەوگەرد: گیاندارێکی ناوچە گەرمەکانە لە توخمی مارمێلکە.
**scintilla** (sin-til′ə), ***n.*** (١) پریشک؛ پزیسک؛ پرژ.
(٢) ئەختالێکە؛ تۆزێک؛ تۆسکاڵ؛ ئەخت.
**scintillant** (sin′tə-lənt), ***adj.*** (١) پریشکهاوێژ؛ پرژفڕێدەر.
(٢) بریقاوە؛ درەوشاوە.
**scintillate** (sin′tə-lāt′), ***v.i.*** (١) پریشک لێبوونەوە؛ پرژ فڕێدان؛ پزیسک هاویشتن. (٢) درەوشانەوە؛ بریقانەوە؛ شەوقدانەوە.
(٣) زیرەکی نواندن؛ زرنگی پیشاندان یا لێ بوونەوە: ***( to ~ witticisms)***
*v.t.* پریشک لێبوونەوە؛ پرژ هاویشتن؛ درەوشانەوە؛ بریقەهاتنەوە.
-scintillating ***(adj.)*** ; scintillatingly ***(adv.).***
**scintillation** (sin′tə-lā′shən), ***n.*** (١) پریشک لێبوونەوە؛ پرژ هاویشتن. (٢) پریشک؛ پرژ؛ پزیسک.
(٣) زرنگی؛ زیرەکی؛ قسەی قووت کردن یەک لە دوای یەک.
(٤) درەوشانەوەی ئەستێرە.
(٥) بریقە (فیزیا). (٦) چاوداگیرساندن.
**scintillation counter,** ئامێری هەستپێکردن و ژماردنی تیشکاوەری (فیزیا)؛ تیشکژمێر.
**sciolism** (sī′ə-liz'm), ***n.*** زانایی درۆ؛ گەزافی زانایی لێدان بە درۆ؛ زانایی ڕووکەش.
**sciolist** (sī′ə-list), ***n.*** زانای درۆ؛ گەزافی زانایی لێدەر بە درۆ؛ زانای ڕووکەش.
-sciolistic ***(adj.).***
**scion** (sī′ən), ***n.*** (١) چووز؛ قەڵەم (موتوربە)؛ تەرز؛ خەلف؛ پەل؛ گۆیکەی پەیوەستکردن. (هەروەها دەیشنووسرێ " cion ").
(٢) نەوە؛ وەچاخ؛ بەرە؛ وەچە.
**scirrhus** (skir′əs), ***n.*** سەدانی شێرپەنجەیی ڕەق.
-scirrhoid ; scirrhous ***(adj.).***
**scissile** (sis′il), ***adj.*** بە ئاسانی دەبڕدرێ؛ توێ توێ دەکرێ یا بەش بەش دەکرێ.
**scission** (sizh′ən, sish′ən), ***n.*** بڕین؛ بڕینەوە؛ کەرت بوون؛ مەلتلیشان؛ قلیشاندن؛ جیابوونەوە؛ بەش بەش بوون؛ پارچە پارچە بوون
**scissor** (siz′ẽr), ***v.t.*** بە مقەست بڕین.
**scissors** (siz′ẽrz), ***n.pl.*** (١) مقەست.

(٢) (ا) مەشقی مقەستی: مەشقێکی تەنافبازییە لاقی پیاو تێیدا دەکرێتەوەو دادەخرێت وەك مەقەست. (ب) **scissors hold**

**scissors hold,** گرتننکە لە زۆرانبازیدا کە یەکێك لە زۆرانبازەکان ئەوی تریانی تێدا دەگرێ لەنێوان لاقەکانیدا.

**scissors kick,** جوولانەوەیەکە لە مەلەکردنی سەرلادا کە لاقی مەلەوان تێیدا دەکرێتەوەو دادەخرێ وەك مقەست.

**scissortail** (siz′ẽr-tāl´), *n.* کلك مقەستی: باڵندەیەکی مێشگرە کلکی لە مقەست دەچێت.

**scissure** (sizh′ẽr, sish′ẽr), *n.* قلیش (دەستکرد یا سرووشتکرد)؛ قلیش؛ دووفاق

**sciuroid** (sī-yoor′oid), *adj.* (١) سموورەیی: لە سموورە دەچێت.
(٢) لە کلکی سموورە دەچێت (ڕووەکناسی)؛ بژ (وەك گوڵە جۆ).

**sclaff** (sklaf, skläf), *v.i. & v.t.* لە زەوی خشاندنی گورزی " گۆلف" پێش لێدانی تۆپەکە.
*n.* ئەم جۆرە لێدانە.

**sclera** (sklêr′ə), *n.* پەردەیەکی سپی ڕەقە چاو دادەپۆشێ بێجگە لە کۆرنیا

**scleriasis** (skli-rī′ə-sis), *n.* ڕەق بوونی ڕیشاڵ (زیندەوەرزانی).

**scleritis** (skli-rī′tis), *n.* هەوکردنی پێستی چاو.

**sclero-, scler-** (sklêr′ō, skler′ə), پێشگرێکە بەمانای:
(١) ڕەق *(sclerometer)*.
(٢) تایبەتی بە " **sclera** "

**scleroderma** (sklêr´ə-dũr′mə), *n.* پێست ڕەقی (پزیشکەوانی)؛ ئەستووربوون و ڕەق بوونی پێست.

**sclerodermatous** (sklêr´ə-dũr′mə-təs), *adj.* (١) پێست ڕەق
(٢) پێست بە پوولەکەی ڕەق داپۆشراو.

**scleroid** (sklêr′oid), *adj.* ڕەق (ژیوارناسی)؛ ڕەق بوو.

**scleroma** (skli-rō′mə), *n.* ڕەق بوونی شانەی لەش؛ پەڵەیەك شانەی ڕەق

**sclerometer** (skli-rom′ə-tẽr), *n.* پێوەری ڕەقی کانزا.

**sclerosed** (skli-rōst′, sklêr′ōzd), *adj.* ڕەق بوو (شانەی لەش بە نەخۆشی)

**sclerosis** (skli-rō′sis), *n.* (١) ڕەق بوونی شانەی ڕووەك (وەك لە پێکهاتنی دارەکەیدا). (٢) (ا) ڕەق بوون و ووشکبوونەوەی شانەو ئەندامو دەماری لەش و لەکارکەوتنی. (ب) نەخۆشی ئەم شانەو دەمار ڕەق بوونە.
**-sclerosal** *(adj.)*.

**sclerotic** (skli-rot′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە نەخۆشی ڕەق بوونی شانەو دەماری لەش؛ ئەم نەخۆشییەی لەگەڵە. (٢) تایبەتی بە " **sclera** ".
*n.* = **sclera.**

**sclerotium** (skli-rō′shi-əm), *n.* ڕیشاڵە ڕەقەی خواردەمەنی تێدا هەڵگیراوی هەندێ کەڕوو

**sclerotomy** (skli-rot′ə-mi), *n.* نەشتەرکاری پەردەی سپی چاو.

**sclerous** (sklêr′əs), *adj.* ڕەق: ڕەق بوو: ئێسقانی؛ وەك ئێسقان لێ هاتوو

**scoff** (skôf, skof), *n.* (١) لاقرتێ؛ گاڵتە؛ گاڵتەپێکردن؛ گاڵتەپێکران
(٢) کەسێك یا شتێکی لاقرتێ پێکراو؛ شتی گاڵتەپێکراو.
*v.t.* لاقرتێ پێکردن؛ گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین
*v.i.* ( ~ **at** ), لاقرتێ پێکردن؛ گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین

**scold** (skōld), *n.* ئافرەتی دەم پیس؛ ژنی جوێن فرۆش و زمان پیس.
*v.t.* سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخان؛ شکاندن؛ ڕەخنەلێگرتن.
*v.i.* (١) سەرزەنشتکردن؛ پیاهەڵشاخین؛ شکاندن؛ ڕەخنەلێگرتن؛ پیاهەڵکانێن.
(٢) جوێن فرۆشتن؛ قسەی پیس کردن.

**scolding** (skōld′iŋ), *n.* سەرزەنشت؛ پیاهەڵشاخان؛ پیاهەڵکانێن؛ شکاندن؛ شکان. *( to give someone a ~ )*

**scolex** (skō′leks), *n.* سەری کرمی شریتی

**scoliosis** (skō´li-ō′sis), *n. Also* **scolioma,** چەوتی لایی ئاسایی بڕبڕەی پشت؛ چەمانەوەی تەنیشتی بڕبڕەی پشت.

**scollop** (skol′əp), *n. & v.t.* = **scallop.**

**scolopendrid** (skol´ə-pen′drid), *n.* هەزارپێ.

**scombroid** (skom′broid), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریایییە.

**sconce** (skons), *n.* مۆمدانی قەد دیوار؛ مۆم هەڵگری قەد دیوار.

**sconce** (skons), *n.* (١) سایەبان؛ کووخ؛ پەناگا؛ پەنا؛ لانە.
(٢) کلاوزری؛ کلاوی ئاسن. (٣) [Colloq.]، (ا) سەر؛ کەللە؛ کەللەسەر
(ب) مێشك؛ زیرەکی؛ سەلیقە. (٤) سەنگەر؛ قەڵا.
*v.t.* (١) سەنگەر بۆ کردن؛ بە سەنگەر پاراستن. (٢) پاراستن.

**sconce** (skons), *v.t.* سزای پارە (بەتایبەتی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لەسەر ڕەوشتی ناشرین).
*n.* ئەم سزایە.

**scone** (skōns), *n.* جۆرێکە لە بسکویت یا کێك.

**scoop** (skōōp), *n.* (١) چەمچە؛ ئاوگردان؛ کەوگیر
(٢) کەوچکی ئاردو شەکرو دانەوێڵە دەرهێنان لە دەفرێك.
(٣) کەوچکی دۆندرمە تێکردن. (٤) کەوچکی نەشتەرگەری.
(٥) خاکەنازی گەورەی مەکینەی هەڵکەندن و ڕامالین.
(٦) کەوچك یا خاکەناز لێدان؛ بە کەوچك یا خاکەناز ڕامالین.
(٧) پڕ چەمچە، کەوگیر، کەوچك، یا خاکەنازێك؛ پڕ کەوچکێك.
(٨) بۆشایی؛ بۆشاییەکی هەڵکەنراو.
(٩) [Colloq.]، قازانجێکی گەورە لە ڕێی پارەبازییەوە.
(١٠) [Slang]، (ا) دەنگوباسێکە کە ڕۆژنامەگەرێك یەکەم کەس بێت دەستی کەوتبێ بە ڕێکەوت یا بە لێهاتوویی خۆی. (ب) دەنگوباسی ووروژێنەر.
(١١) [Slang]، کورتە یا درێژەی دەنگوباسێك؛ ڕوودانێك یا بارێك.
*v.t.* (١) تێکردن یا دەردان (بە کەوچك، چەمچە، خاکەناز).
(٢) ( ~ **out** )، هەڵکەندن و دەردان؛ بۆش کردن.
(٣) بەتاڵکردنەوە؛ لێ دەرهێنان؛ هیچ تێدا نەهێشتن.
(٤) ( ~ **up** )، کۆکردنەوە؛ ڕامالین؛ خڕکردنەوە؛ پەلاماردان و ڕامالین؛ هەڵهێنجان. (٥) [Slang]، بڵاوکردنەوەی دەنگوباسێکی ووروژێنەر لەپێش ڕۆژنامەکانی تردا؛ دەستپێشکەری کردن لە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسێکدا

**scoopful** (skōōp′fool´), *adj.* پڕ چەمچەیەك: پڕ کەوگیرێك؛ پڕ کەوچکێك؛ پڕ خاکەنازێك.

**scoot** (skōōt), *v.i.* [Colloq.], بە پەلە ڕۆیشتن؛ بە هەڵەداوان ڕۆیشتن؛ تێ تەقاندن؛ بۆی دەرچوون
*n.* [Colloq.], بە هەڵەداوان ڕۆیشتن؛ بە پەلە ڕۆیشتن یا بۆی دەرچوون.

**scooter** (skōōt′ẽr), *n.* (١) پاسکیلێکی منداڵانەیە بە یەك پێ لێ دەخوڕێ. (٢) ماتۆڕسکیلی بچووك.
(٣) بەلەمی بن تەخت (بۆ سەر ئاو یا سەهۆڵ).
(٤) بەلەمی تیژڕەو

**scop** (skop, skōp), *n.* هۆنەری ئەنگلۆ-ساکسۆنی؛ شایەری ئینگلیزی کۆن

**scope** (skōp), *n.* (١) ڕادەی تێگەیشتن؛ مەودای بینین؛ توانا بەسەردا شکان: *( beyond the ~ of child's understanding)*
(٢) مەودا: *( the ~ of a history book)*
(٣) هەل؛ بوار. (٤) ماوەی بڕکردنی مووشەك
(٥) درێژی؛ ماوەی بڕکردنی شتێك (وەك گوریس).
(٦) [Archaic]، ئامانج؛ مەبەست.

**-scope** (skōp), پاشگرێکە بەمانای: تێڕوانین؛ بینین؛ سەیرکردن؛ هی تێڕوانین؛ دۆزەرەوە *( telescope)*.

**scopolamine** (skō-pol′ə-mēn´), *n.* سکۆپۆلامین: ماددەیەکی قلیەیییە لە هەندێ ڕووەك وەردەگیرێ (دەرمانی نووستنی لێ درووست دەکرێت.

**scopoline** (skō′pə-lēn´, skō′pə-lin), *n.* سکۆپۆلین: ئاوێتەیەکی بێ ڕەنگە بۆ سڕکردن و نوواندن بەکاردەهێنرێت.

**scopula** (skop′yoo-la), *n.* تۆپەڵە موو (بە هەندێك جانەوەرەوە).
-scopulate *(adj.).*
**-scopy,** پاشگرێکە بەمانای تێڕوانین؛ تێبینین؛ پشکنین
*( microscopy)*
**scorbutic** (skôr-bū′tik), *adj.* نەخۆشی ئەسکەربووتی هەیە؛
تایبەتی بەم نەخۆشییە؛ ئەسکەربووتی. (ووشەی " scurvy " ببینە).
-scorbutical *(adj.).*
**scorch** (skôrch), *v.t.* (١) سووتاندن؛ هەڵقرچاندن؛ هەڵکرووزان؛
برژاندن (٢) هەست بریندارکردن؛ داخ کردن؛ بریندارکردن (بە ڕەخنەو هێرشی
توندوتیژ) (٣) سووتاندن و وێرانکردنی شوێنێك (پێش ئەوەی دوژمن بیگرێت).
*v.i.* (١) سووتان؛ داخ بوون؛ هەڵکرووزان؛ هەڵقرچان.
(٢) [Colloq.]، ئوتومبیل لێخوڕین زۆر بەخێرایی.
*n.* سووتاوییەکی ڕووکەشی؛ سووتانێکی کەم؛ هەڵکرووزان؛ هەڵقرچان.
**scorched-earth policy,** سووتاندن و وێرانکردنی ناوچەیەك
پێش ئەوەی دوژمن بیگرێت.
**scorcher** (skôr′chēr), *n.* (١) سووتێنەر؛ هەڵکرووزێنەر؛ داخکەر.
(٢) [Colloq.]. ڕۆژێکی زۆر گەرم.
(٣) ڕەخنەی توندوتیژ؛ ووتەی هەست بریندارکەر؛ توانجی بڕ.
(٤) ئوتومبیل لێخوڕی زۆر خێرا؛ ڕانەری ئێجگار خێرا.
**score** (skôr, skōr), *n.* (١) (ا) ڕووشان؛ ڕووشاوی؛ نیشانەی کەل.
(ب) هێڵی سەرەتا یا کۆتایی پێشبڕکێ.
(ج) هێڵی ڕاکێشراو بە تەباشیر یا لەسەر تەختە بۆ حساب ڕاگرتن.
(٢) حسابی قەرز؛ قەرز *( to run up a ~ )*
(٣) قین؛ کونە قین؛ ڕق؛ سکالا: *( to pay off an old ~ )* .
(٤) هۆ؛ هۆی پاڵپێوەنەر.
(٥) خاڵ (پێشبڕکێ، وەرزش)؛ سەرجەمی خاڵی براوە:
*( to keep ~; The ~ is 8 to 3 .)*
(٦) نمرە (تاقیکردنەوە) *( His ~s were high on two of the tests.)* .
(٧) (ا) بیست (کەس، شت...هتد).
(ب) ( *pl* ). ژمارەیەکی زۆر؛ ژمارەیەکی بێ شومار؛ گەلێك: *( ~s of men)* .
(٨) [Colloq.]. کارێك یا چالاکییەکی سەرکەوتوو؛ بردنەوە؛ سەرکەوتن.
(٩) [Colloq.]، ڕاستی بارێك یا شتێك بە ڕێكوڕەوانی؛ ئاگا لە شت بوون:
*( to know the ~ )*
(١٠) (ا) پارچەیەك مۆسیقای نووسراوە
(ب) مۆسیقای فیلمێکی قۆشمە
*v.t.* (١) نیشانەکردن (بە هێڵ پیاهێنان یا بڕین یا هەڵکەندن)؛ کەل کردن؛
ڕووشاندن (بۆ نیشانە). (٢) هێڵ بەژێردا هێنان؛ بە پێنووس هێڵ پیاهێنان.
(٣) ( ~ out ) ، پووچکردنەوە بە هێڵ پیاهێنان.
(٤) ژمارە ڕاگرتن بە هێڵ یا نیشانە؛ حساب ڕاگرتن
(٥) نیشانەکردن بۆ حساب ڕاگرتن.
(٦) (ا) بردنەوە (ئەوەندە خاڵ لە یارییەکدا)؛ خاڵ گرتن:
*( He ~d five points for his team.)*
(ب) تۆمارکردنی خاڵی براوە.
(٧) زۆر بە توندی سەرزەنشتکردن؛ شکاندن؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن.
(٨) نمرە لەسەردانان (تاقیکردنەوە)؛ هەڵسەنگاندن: *( to ~ a test)* .
(٩) نمرە هێنان (قوتابی)؛ وەرگرتن (نمرە):
*( She ~d high on all her exams.)*
(١٠) پێشکەوتن؛ بردنەوە؛ سەرکەوتن؛ دەسکەوتن.
(١١) ئاژنینەوەی گۆشت بە چەقۆ (بۆ ئاووخوێ هەڵمژین و باش برژان).
(١٢) نووسین؛ ڕێکخستن؛ یا دانانی پارچە مۆسیقا
*v.i.* (١) خاڵ بردنەوە (پێش بڕکێ، یاری).
(٢) تۆمارکردنی خاڵی براوەی پێش بڕکێیەك.
(٣) سەرکەوتن؛ پێشکەوتن؛ بردنەوە
(٤) ڕووشاندن؛ هێڵ پیاهێنان؛ کەل کردن؛ نیشانەکردن (بە هێڵ).
**keep ( the ) score,** حساب ڕاگرتن
**on the score of,** بە هۆی؛ لەبەر.
**on that score,** (١) (ا) لەبەر ئەوە؛ بە هۆی ئەوەوە.
(ب) لەو ڕووەوە؛ لەبارەی ئەوەوە:
*( You have nothing to worry about on that score.)*
**pay off ( settle ) old scores,** تۆڵەکردنەوە (بۆ کۆنە قین)؛
تۆڵەسەندنەوە.
**pay ( wipe off ) scores,** قەرزدانەوە.
**run up a score,** کەوتنە ژێر قەرزەوە؛ قەرزاربوون.
**score-board,** تەختەی تۆمارکردنی خاڵی براوە (پێشبڕکێ، یاری).
**score-card,** (١) کارتی تۆمارکردنی خاڵی براوە (پێشبڕکێ، یاری).
(٢) کارتێکە ناو و ئەرکی یاریکەرانی لەسەر نووسراوە (بۆئەوەی هەر
سەیرکەرێك بیەوێ خاڵە براوەکانی هەر یاریکەرێکی لەسەر بنووسێ).
**score-keeper,** تۆمارکەری خاڵی براوە (یاری، پێشبڕکێ).
**scorer** (skôr′ēr, skōr′ēr), *n.* (١) تۆمارکەری خاڵی براوە (یاری،
پێشبڕکێ). (٢) خاڵ بەرەوە؛ گۆڵکەر؛ یاریکەری خاڵ بەرەوە.
**scoria** (skôr′i-ə, skō′ri-ə), *n.* (١) خڵتەی کانزا (پاش تواندنەوەو
پوختکردنی)؛ تڵپە یا سەرکەفی کانزا. (٢) تڵپەی ئاگرپژێن؛
وورده پارچەی ئاگرپژێن؛ ئاگرپژێنی شلی ژیلەمۆیی.
-scoriaceous *(adj.).*
**scorify** (skôr′ə-fī′, skō′rə-fī′), *v.t.* پوختەکردنی کانزاو خڵتە
لێ لابردنی (بە تواندنەوە).
-scorification *(n.).*
**scorn** (skôrn), *n.* (١) لاقرتێ؛ گاڵتە؛ بە چاوی نزم سەیرکردن؛
پێ پێکەنین؛ بە سووك تەماشاکردن؛ لچ لێ هەڵقورتان؛ ڕق.
(٢) گاڵتەچی؛ جێی پێ پێکەنین یا بە سووك سەیرکردن.
*v.t.* بە چاوی نزم سەیرکردن؛ لاقرتێ پێکردن؛ گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین؛
بە سووك تەماشاکردن؛ ڕق لێ بوونەوە؛ لچ لێ هەڵقورتان.
*v.i.* [Obs.]. گاڵتە پێ هاتن؛ گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.
**laugh to scorn,** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.
**scornful** (skôrn′fəl), *adj.* گاڵتەپێکەر؛ لچ هەڵقورتێنەر؛
بە سووك سەیرکەر؛ گاڵتە پێ هاتوو؛ لاقرتێچی.
-scornfully *(adv.)* ; scornfulness *(n.).*
**scorpaenoid** (skôr-pē′noid), *adj.* هی ماسی دووپشکی.
*n.* ماسی دووپشکی.
**Scorpio** (skôr′pi-ō′), *n.* (١) کۆنەستێرەی دووپشك؛
کەلووی دووپشك. (٢) بورجی دووپشك (ئەستێرەوانی).
**scorpioid** (skôr′pi-oid′), *adj.* (١) دووپشکی.
(٢) هی توخمی دووپشك. (٣) کلك هەڵگەڕاوە یا چەماوە وەك دووپشك
**scorpion** (skôr′pi-ən), *n.* (١) دووپشك.
(٢) قامچی چوقڵەدار ( ئینجیل). (٣) [S-] = Scorpio .
**scorpion fish,** ماسییە دووپشکی (بڕبڕەکەی ژەهراوییە).
**scorpion fly,** جانەوەرە دووپشکی (ئەندامی زاوزێی نێرەکانیان لە
چزوی دووپشك دەچێ و بەژێر سکییەوەیە).
**Scorpius** (skôr′pi-əs), *n.* کۆنەستێرەی دووپشك.
**Scot** (skot), *n.* (١) ئوسکوتلەندی؛ کەسێکی ئوسکوتلەندی.
(٢) هاونیشتمانی ئوسکوتلەندە.
**scot** (skot), *n.* باج.
**pay scot and lot,** ئەرکی دارایی سەرشان جێبەجێکردن بە تەواوی؛
هەموو دانەوە (قەرز، باج)؛ باجی خۆ دان بە تەواوی؛ هەموو دان.
**scot and lot,** باجێکی ئینگلیزی کۆنی ناوچەیییە بەپێی توانا دەدرا.
**Scotch** (skoch), *adj.* (١) ئوسکوتلەندی (گەل، زمان، کلتوور...هتد).
(٢) [Slang]، پوولەکی؛ پیسکە؛ ڕەزیل.
*n.* (١) زمانی ئوسکوتلەندی؛ ئوسکوتلەندی.
(٢) وێسکی ئوسکوتلەندی؛ وێسکی.
**the Scotch,** گەلی ئوسکوتلەندی.

**scotch** (skoch), *v.t.* (١) رووشان؛ کەل کردن؛ بڕین.
(٢) بریندارکردن؛ پەل شکاندن؛ پەکخستن.
(٣) دامرکاندنەوە (قاو، نەخشە، پیلان)؛ پووچکردنەوە؛ پەرچدانەوە؛ پێشێل کردن.
*n.* (١) رووشاوی؛ رووشان؛ تلیش. (٢) هێڵی یاری خەت خەتێن.
**scotch** (skoch), *v.t.* راگرتن بۆ خل نەبوونەوە (تایەی ئوتومبیل و شتی تر بە بەرد، خشت، یا پارچە دار خستنەبەری لە بەرەوخوارکەدا).
*n.* پارچە بەرد، خشت، یا دارێکە کە دەخرێتە بەر تایەی ئوتومبیل یا شتی تر بۆ خل نەبوونەوە یا نەخزانی.
**Scotchman** (skoch′mən), *n.* = Scot = Scotsman.
**Scotch tape,** شریتی ئوسکوتلەندی: شریتێکی سرێشاوی باریک و تەنکە بۆ شت پێکەوەنووسان و قایم کردن.
**Scotch terrier,** = Scottish terrier.
**Scotch verdict,** (١) بڕیاری دادگای بە لایەکدا نەخراو یا ناتەواو.
(٢) بڕیاری یەکلا نەکراوە؛ بڕیاری نیوە ناتەواو.
**Scotch whisky,** ویسکی ئوسکوتلەندی؛ ویسکی.
**scoter** (skō′tēr), *n.* مراوییەکی دەریایی ناوچەکانی تەوەری باکوورە.
**scot-free** (skot′frē′), *adj.* (١) باج نەدەر؛ بەخشراو لە باج؛ باجی لەسەر نییە. (٢) سزا نەدراو؛ زیان لێ نەکەوتوو؛ هیچ لێ نەهاتوو یا نەکراو:
*( The criminal got off ~ .; to go ~ despite an offense)*
**Scotia** (skō′shə, skō′shi-ə), *n.* [Poetic], ئوسکوتلەندە.
**scotia** (skō′shə, skō′shi-ə), *n.* نەخشێکی ڕازێنەرەوەی قوپاوە بە بنی پایەوە.
**Scotland Yard,** (١) شەقامێکی کورتە لە لەندەن.
(٢) پۆلیسخانەی لەندەن؛ بارەگای پۆلیسی لەندەن.
(٣) پۆلیسی لەندەن بەتایبەتی بەشی پشکنین یا لێکۆڵینەوەی تاوان.
**scoto-** (skōt′ō, skō′tə), پێشگرێکە بەمانای: تاریکی؛ تاریکایی.
**scotoma** (skə-tō′mə), *n.* ناوچەی تاریکی بینایی؛ ناوچەی نەبینراوی مەودای بینایی.
**Scots** (skots), *adj.* ئوسکوتلەندی.
*n.* زمانی ئوسکوتلەندی
**Scotsman** (skots′mən), *n.* = Scot.
**Scotticism** (skot′ə-siz′m), *n.* ووتەیەك یا زاراوەیەکی ئوسکوتلەندی.
**Scottish** (skot′ish), *adj.* ئوسکوتلەندی (گەل، زمان، کلتوور...هتد).
*n.* زمانی ئوسکوتلەندی.
**the Scottish,** ئوسکوتلەندییەکان.
**Scottish terrier,** سەگێکی ڕاوی بچووکی لاق کورتی تووك لوولی لموز ئەستووری گوێ قوتە (پێشتی دەوترێ: " Scotch terrier ").
**scoundrel** (skoun′drəl), *n. & adj.* ناکەس؛ نزم؛ ناپەسەند.
-scoundrelly *(adv.)*.
**scour** (skour), *v.t.* (١) (ا) مەنجەڵ سپیکردنەوە (مسگەری)؛ پاك کردنەوە (بە تەلی ئاسن، سابوون...هتد)؛ هەڵگلۆفین؛ لێکخستن؛ بریقە لێ هەڵساندن: *( to ~ pots and pans)* .
(ب) ( **off** ~ )، ژەنگ یا بەڵغ لێکردنەوە.
(٢) جۆماڵ کردن؛ ئاو پیاکردن و ڕاماڵین (زێراب).
(٣) سك و ڕیخۆڵە داشۆرین؛ ناوسك پاك کردنەوە.
(٤) بژاردن (گەنم پێش هاڕینی).
(٥) لێ پاك کردنەوە؛ نەهێشتن؛ سەرنگوم کردن؛ گسك لێدان (مەجاز):
*( The navy ~ed the sea of enemy ships.)*
*v.i.* (١) مەنجەڵ سپیکردنەوە (مسگەری)؛ پاك کردنەوە (بە تەلی ئاسن، لێخستن، سابوون...هتد). (٢) سکچوون (مەڕومالات)؛ تووشی بەلەفیرە بوون؛ تووشی زەحیری بوون.
*n.* (١) پاك کردنەوە؛ مەنجەڵ سپیکردنەوە؛ بریقە لێ هەڵسان؛ بەڵغ لێکردنەوە.
(٢) ماددەی بەڵغ و پیسی لێکردنەوە؛ ماددەی شت پاك کردنەوە.
(٣) شوێنی جۆماڵ کراو یا پاك کراوە.
(٤) (*pl.*)، بەلەفیرێ؛ سکەشۆرێ (مەڕومالات)؛ شۆڕی؛ زەحیری مەڕومالات.
**scour** (skour), *v.t.* بە پەلە بۆ گەڕان؛ بە شوێندا گەڕان بە پەلە؛ پشکنین:
*( He ~ed the library for the book.)*
*v.i.* بە پەلە پێداگەڕان؛ بە شپرزەیی بۆ گەڕان یا پشکنین.
**scourge** (skūrj), *n.* (١) قامچی. (٢) هۆی سزادان یا چەوساندنەوە.
(٣) هۆی ناخۆشی؛ کارەسات؛ بەڵا؛ دەردی سەری:
*( After the ~ of war usually comes the ~ of disease.)*
*v.t.* (١) قامچی لێدان؛ فەلاقەکردن.
(٢) ئازاردان؛ سزادان؛ چەوساندنەوە؛ بە توندی ڕەخنەلێگرتن.
**scouring rush,** کلکە ئەسپ: ڕووەکێکی لاسك بۆشە کەڵاکانی پووڵەکاوین کانزاو تەختەو دەفریان پێ پاك دەکرێتەوە.
**scourings** (skour′iŋz), *n.pl.* (١) خلتەو بەڵغ و پیسایی (کە لە دەفرێك دەکرێتەوە بە پاك کردنەوەی). (٢) سەرکۆزەر (وەك داڕوجان و شتی تر کە لە گەنم بژار دەکرێت پێش هاڕینی).
**scouse** (skous), *n.* = lobscouse.
**scout** (skout), *n.* (١) سووسەکەر؛ پێشەنگی سووسەکەر (سەرباز، کەشتی، فڕۆکە). (٢) سووسەکردن؛ سووسە؛ دیدەوانی؛ دەنگوباس دزین.
(٣) دیدەوان؛ ئەندامی تیپی دیدەوانی. (٤) [Slang]، لاو؛ کابرا؛ زەلام
(٥) بەدواداگەڕاوی کەسانی لێهاتوو بۆ تیپی یاری و شانۆگەری و سینەما.
*v.t.* (١) سووسەکردن؛ دەنگوباس لێ دزین.
(٢) سەرنج پێدان؛ تێبینین و هەڵسەنگاندن (بۆ وەرگرتن لە تیپی وەرزشدا یا بۆ شانۆگەری و سینەما).
(٣) ( **around** ~ )، بۆ گەڕان؛ بە شوێندا گەڕان.
*v.i.* (١) سووسەکردن؛ دەنگوباس دزین.
(٢) بۆ گەڕان؛ بە شوێندا گەڕان؛ سۆراخ کردن:
*( to ~ around for some firewood)*
(٣) دیدەوانی کردن؛ ئەندامێتی تیپی دیدەوانی کردن (کوڕ یا کچ).
**scout** (skout), *v.t.* گاڵتە پێ هاتن (بیروباوەڕ، پێشنیاز)؛ بە هیچ‌ویووچ دانان؛ پێ پێکەنین؛ بە هیچ دانان.
**scouting** (skout′iŋ), *n.* دیدەوانی کردن (کوڕ یا کچ)؛ ئەندامی تیپی دیدەوانی بوون.
**scout-master** (skout′mas′tēr, skout′mäs′tēr), *n.* سەرتیپی دیدەوانی.
**scow** (skou), *n.* بەلەمێکی بن تەختی گۆشە ڕێکی گەورەی بار بار گواستنەوەیە.
**scowl** (skoul), *v.i. & v.t.* مۆن بوونەوە؛ پیش خواردنەوە؛ مۆڕبوونەوە؛ خێسەکردن.
*n.* مۆنی؛ مۆن بوونەوە؛ مڕومۆنی؛ پیش خواردنەوە؛ خێسە: مۆڕبوونەوە
-scowler *(n.)* ; scowlingly *(adv.)*.
**scrabble** (skrab′'l), *v.i.* (١) چینەکردن؛ چنگەکڕێ کردن.
(٢) پەلەقاژێ کردن؛ پەل کوتان.
(٣) بە قلی‌وبلی نووسین؛ بە لامسەرلایی نووسین.
*v.t.* (١) بە پەلە کۆکردنەوە یا پەیداکردن؛ بە چنگەکڕێ گردکردنەوە
(٢) بە قلی‌وبلی نووسین.
*n.* (١) چینە؛ چنگەکڕێ؛ چینەکردن.
(٢) پەیداکردن یا گردکردنەوە بە پەلە.
(٣) نووسینی قلی‌وبلی؛ نووسینی لامسەرلایی و بێ مانا.
(٤) پەلەقاژێ؛ پەل کوتان.
**scrabble** (skrab′'l), *n.* یاری ووشە دروستکردن یا پێکەوەنان.
**scrag** (skrag), *n.* (١) مرۆڤ یا گیانداری ڕەقەڵەو لەڕو لاواز.
(٢) ڕووەك یا درەختی باریکەڵەو گەشە نەکردوو.
(٣) ملی مەڕو گوێرەکە؛ گۆشتی مل. (٤) [Slang]، ملی مرۆڤ
*v.t.* [Slang], مل بادان و کوشتن؛ هەڵواسین؛ مل هەڵکێشان؛ خنکاندن.

**scraggly** (skrag′li), *adj.* بڕو شانەنەکراو (ڕیش)؛ پاك ڕانەگیراو؛
خواروخێچو قەراغ تیژ (بەرد)؛ نارێك؛ شکاو
**scaraggy** (skrag′i), *adj.* (١) بڕو شانەنەکراو (ڕیش)؛ پاك ڕانەگیراو؛
خواروخێچو قەراغ تیژ (بەرد)؛ نارێك؛ شکاو.
(٢) ڕەقەڵە؛ لەڕولاواز؛ ڕیوەڵە؛ سیسەڵە.
-scraggily *(adv.)* ; scragginess *(n.)*.
**scram** (skram), *v.i.* [Slang], لاچۆ لێرە! (بۆ سەگو پشیلە دەرکردن)؛
برۆ دەرەوە! ؛ لاچۆ!
**scramble** (skram′b'l), *v.i.* (١) بە جنگەکڕێ پیاهەڵگەڕان؛
بە دەست و پێ پیاهەڵگەڕان بە پەلە.
(٢) پاڵەپەستۆکردن بۆ بردن یا دەسکەوتنی شتێك؛ شەڕ لەسەر کردن:
*( The players ~d for the ball.)*
(٣) بە پەلە هەڵسان بۆ بەرەوبڕی دانەوەی پەلاماری کوتوپڕی فڕۆکەی دوژمن
لە ئاسماندا
*v.t.* (١) تێکەڵ کردن بە پەلەو لامسەرلایی؛ تێکەڵ و پێکەڵ کردن؛ بەسەریەکدادان
بە پەلە؛ شێواندن بەسەریەکدا (٢) ( ~ up )، بە پەلە کۆکردنەوەو هەڵسانی
فڕۆکە بۆ بەرەنگاربوونی فڕۆکەی دوژمن (لە هێرشی ناکاو و کوتوپڕدا).
(٣) هێلکە سوورکردنەوە بە تێکەڵاوکردنی زەردێنەکەی و سپێنەکەی (هەندێك
جار بە ئەختێك شیرەوە). (٤) تێکدانی بەرنامەی تەلەفزیۆنی (بۆ ئەوەی
وەرنەگیرێ بەبێ ئامێری تایبەتی).
*n.* (١) پیاهەڵگەڕانێکی گران بە چنگەکڕێ یا بە دەست و پێ.
(٢) پاڵەپەستۆ (بۆ شتێك کە هەمووکەسێکی تر بیەوێ)؛ شەڕ لەسەرکردن.
-scrambler *(n.)*.
**scrambled eggs,** هێلکەی ئەختێك سوورەوەکراوی زەردێنەو سپێنەی
تێکەڵاوکراو (هەندێك جار بە شیرەوە).
**scrannel** (skran′'l), *adj.* [Archaic], (١) ڕەقەڵە؛ باریکەڵە؛ لاواز؛
بچووك؛ گەشە نەکردوو (٢) ناسازو کز (دەنگ)؛ ناخۆش.
**scrap** (skrap), *n.* (١) پارچەی بچووك؛ ئەخت؛ تۆز:
*( a ~ of paper)*
(٢) پارچەیەك شتی نووسراو.
(٣) پارچە ئوتومبیلی شکاو؛ ئاسنی لەت و پەت؛ سکراپ.
(٤) وورده شتومەکی بێ فەڕی کۆنی فڕێدراو؛ سەرەمقەست؛ شڕە؛
وورده پارچە؛ شتی لەت و پەت
(٥) ( *pl.* ) بەرماوە؛ پاشماوە (خواردەمەنی)؛ ووردەنان و خواردنی تری
بەرماوە (٦) ( *pl.* ) ، چزڵێك.
(٧) ( *pl.* ) ، وێنەو پارچە ڕۆژنامەو نووسراوی تری یادگار (کە دەنووسێنرێ
بە لاپەڕەکانی پەڕاوێکەوە بۆ یاداشت).
*adj.* فڕێدراو؛ بێ فەڕ؛ بەرماوە؛ بەکارنەماو.
*v.t.* (١) هەڵوەشاندن یا پارچە پارچە کردن و هەندێ لە پارچەکانی بەکارهێنان و
فڕێدانی ئەوانی تر (ئوتومبیل)؛ سکراپ کردن
(٢) فڕێدان (لەبەر کۆنی و بێ کەڵکی):
*( You ought to ~ that old bicycle and buy a new one.)*
-scrapper *(n.)*.
**scrap** (skrap), *n.* [Slang], شەڕ؛ دەمەقاڵێ
*v.i.* [Slang], شەڕکردن؛ دەمەقاڵێ بوون.
**scrap-book** (skrap′book′), *n.* پەڕتووکی وورده شت؛ پەڕتووکێکی
لاپەڕە سپییە وێنەو پارچە ڕۆژنامەو نووسراوی تری پێوە دەنووسێنرێ بۆ
هەڵگرتنی بۆ یادگار.
**scrape** (skrāp), *v.t.* (١) لێخشاندن بە توند؛ لێکخستن؛
شتی زبر لێخستن بۆ پاك کردنەوە (وەك تەلی ئاسن لە مەنجەڵ).
(٢) کڕاندن (وەك بنی مەنجەڵ بە کەوچك).
(٣) ( ~ off ; ~ out ; ~ from )، لێکردنەوە (بەڵغ، ژەنگ، پیسایی)؛
پاك کردنەوە؛ داتاشین؛ لێ لابردن بە شتی زبر لێخستن:
*( to ~ grease from pots and pans)*
(٤) ڕووشاندن
(٥) بە ئاستەم لێخشاندن؛ بە ئاستەم بەرکەوتن.
(٦) چنگەکڕێ کردن؛ بە چنگ هەڵکەندن یا دەردان.
(٧) ( ~ up ; ~ together )، بە کولەمەرگی کۆکردنەوە؛
بە چنگەکڕێ پەیداکردن یا دەسکەوتن؛ هەڵکڕاندن:
*( He ~d up some money.)*
*v.i.* (١) کڕاندن و پاك کردنەوە (بە شتی زبر)؛ لێخستن و پاك کردنەوە
(٢) کڕاندن؛ دەنگێکی ناخۆش لێ پەیداکردن (وەك دەنگی بنکر کڕاندن و ددان
جیڕکردنەوە). (٣) بە کولەمەرگی کۆکردنەوە؛ بە چنگە کڕێ پەیداکردن یا
دەسکەوتن. (٤) بە کولەمەرگی ژیان.
(٥) قاچ خشاندنە دواوە لەکاتی کڕنووش بردندا.
*n.* (١) کڕاندن؛ هەڵکڕان.
(٢) ڕووشاوی؛ ڕووشان؛ شوێنی ڕووشاو یا کڕێنراو
(٣) کرەکڕ؛ دەنگی کڕاندن یا لێخشان.
(٤) تەنگوچەڵەمە؛ باری دژواری خۆ کرد.
bow and scrape, کڕنووش بردن؛ زۆر ملکەچی کردن؛
کلکەلەقێ کردن یا دەربردن.
scrape a living, بە کولەمەرگی ژیان؛ بە مەمرەو مەژی ژیان.
**scraper** (skrāp′ẽr), *n.* (١) کڕێنەر؛ مرۆڤی دەفرکڕێنەرو پاککەرەوە.
(٢) ئامێر یا شتی پێ کڕاندن و پاك کردنەوە.
**scraping** (skrāp′iŋ), *n.* (١) کڕاندن؛ کڕاندن و پاك کردنەوە؛
لێکردنەوە (بەڵغ، پیسی... هتد). (٢) کرەکڕ؛ دەنگی کڕاندن.
(٣) ( *pl.* ) ، شتی کڕێنراوو پاك کراوە؛ شتی کۆکراوە بە چنگەکڕێ
**scrap iron,** ئاسنی لەت و پەت؛ ئاسنی بەکارهێنراو یا فڕێدراو.
**scrapper** (skrap′ẽr), *n.* [Slang], شەڕکەر؛ شەڕەنگێز؛ شەڕانی.
**scrapple** (skrap′'l), *n.* خواردەمەنییەکە بریتییە لە پارچە گۆشتی
بەرازی تێکەڵاوکراو لەگەڵ ئاردی گەنمەشامی و سوورەوەکراو بە توێ توێ.
**scrappy** (skrap′i), *adj.* (١) لەت و پەت؛ سەرەمقەستی؛
پارچە پارچە؛ کەرت کەرت؛ لەت لەت. (٢) پچڕ پچڕ: *( ~ thinking)*
**scrappy** (skrap′i), *adj.* [Slang], شەڕانی؛ شەڕەنگێز؛ شەڕفرۆش.
**scratch** (skrach), *v.t.* (١) ڕووشاندن
(٢) چنگ لێدان؛ ڕنین (بە چنگ وەك پشیلە).
(٣) چینەکردن؛ چنگەکڕێ کردن؛ بە چنگ هەڵکەندن.
(٤) خوراندن؛ هەڵکڕان.
(٥) کڕاندن؛ لێخستن؛ پیاهێنان بە کرەکڕ:
*( He ~ed a match on the wall.)*
(٦) بە قلی و بلی نووسین؛ بە لامسەرلایی نووسین.
(٧) ڕەش کردنەوە (نووسین)؛ هێڵ پیاهێنان و کوژاندنەوە.
(٨) ( ~ up )، بە چنگەکڕێ کۆکردنەوە؛ هەڵکڕاندن.
(٩) کشانەوە یا ناو کوژاندنەوە (غارغارێن، پێشبڕکێ).
*v.i.* (١) چنگ لێدان؛ ڕنین (بە چنگ وەك پشیلە).
(٢) چینەکردن؛ چنگەکڕێ کردن. (٣) خوراندن؛ هەڵکڕان.
(٤) بە کولەمەرگی دەربردن؛ بە چنگە کڕێ ژیان.
(٥) کڕاندن؛ پیاهێنان بە کرەکڕ.
(٦) کشانەوە یا ناو کوژانەوە (پێشبڕکێ، غارغارێن).
*n.* (١) (ا) ڕووشاوی؛ ڕووشان. (ب) هێڵی ڕووشێنەر.
(٢) برینێکی زۆر کەم (بە چنگ لێدان یا شتی تیژ).
(٣) کرەکڕ؛ دەنگی کڕاندن.
(٤) نووسینی قلی و بلی؛ نووسینی لامسەرلایی.
(٥) هێڵی دەستپێکردنی پێشبڕکێ (ڕاکردن).
(٦) (ا) لێدانێکی باشی ڕێکەوت (بلیارد). (ب) لێدانی هەڵە (بلیارد)
(٧) یاریکەری کشاوە یا ناو کوژاوە.
(٨) دان (کە ڕۆدەکرێت بۆ مریشك و کەڵەشێر و باڵندەی تر بۆ چینەکردن؛
(پێشی دەووترێ: " scratch feed " ).
(٩) [Slang]، پارە.
*adj.* (١) لە سەرەتاوە یا نووکەوە دەستپێکەر (یاریکەر).

(٢) ڕێكەوت: *(a ~ shot)* .

(٣) سەرپێیی؛ لامسەرلایی؛ هەر چۆن ڕێكەوێ وەها: *(a ~ team)* .

**from scratch,** لە نووكەوە؛ لە سەرەتاوە؛ لە هیچەوە؛ لە سفرەوە.

**scratch along,** بە كولەمەرگی ژیان؛ بە مەمرەومەژی ژیان.

**scratch one's head,** سەری خۆ خوراندن (لە سەرسامی یا حەپەساندا)؛ سەرسوڕمان.

**up to scratch,** (١) ئامادەیە بۆ پێشبڕكێ.

(٢) [Colloq.]، ئامادەیە بۆ هەمووشتێك؛ لە دۆخێكی باشدایە.

(٣) [Colloq.]، بەپێی پێویستە؛ هارتایە؛ لێهاتوو.

**scratch hit,** لێدانی ڕێكەوتی باش (بێیسبۆل).

**scratch line,** (١) هێڵی پێشبڕكێ دەستپێكردن (ڕاكردن).

(٢) هێڵێكە كە پێشبڕكێكەر نابێ لێی تێپەڕبێت.

**scratch paper,** كاغەزی ڕەشنووس.

**scratch sheet,** پەڕەی ئەسپە كشێنراوەكان لە غارغارێندا.

**scratch test,** تاقیكردنەوەیەكە بۆ زانینی هەستیاری نەخۆشێك بەرامبەر هەندێك دەرمان بریتییە لە بە ئاستەم كوتانی نەخۆشەكە بە دەرمانێك كە هەستیاری پەیدادەكات.

**scratchy** (skrach′i), *adj.* (١) قلی وبلی‌یانە؛ تێكەڵاوپێكەڵاو؛ بە نەزانانەو لامسەرلایی كراو (نیگار، وێنە): *(a ~ drawing)* .

(٢) كرەكر لێوەهاتوو؛ كرەكرەكەر: *(a ~ record, pen, etc.)* .

(٣) لامسەرلایی؛ بێ سەروبن؛ ناڕێك‌وپێك.

(٤) زبر (كاڵا)؛ لەش هێنەرە خورو: *(~ cloth)* .

**scrawl** (skrôl), *v.t. & v.i.* بە پەلەو تێكەڵاوپێكەڵاوی نووسین؛ بە ناڕێك‌وپێكی نووسین.

*n.* نووسینی قلی‌وبلی؛ نووسینی ناڕێك‌وپێك‌و بێ سەروبن.

**-scrawniness** *(n.).*

**screak** (skrēk), *v.i. & n.* = screech.

**scream** (skrēm), *v.i.* (١) قیژاندن (لە ترس، تووڕەیی، یا ئازاردا)؛ هاواركردن؛ قیژەكردن؛ شیراندن؛ زریكاندن؛ قاوقیژكردن.

(٢) بە دەنگی بەرزو شێتانە پێكەنین؛ بە قاقا پێكەنین.

(٣) قسەكردن یا نووسین بە توندوتیژی.

(٤) سەرنج زۆر ڕاكێشان؛ بوون بە هۆی تۆقان یا سەرسوڕماندن.

*v.t.* بە هاوارەوە وتن؛ قیژاندن؛ شیراندن.

*n.* (١) قیژە؛ هاوار؛ قیژەقیژ؛ شیرە؛ قیرە؛ زریكە؛ قاووقیژ.

(٢) [Colloq.]، كەسێكی زۆر سەیرخۆش؛ كەسێكی زۆر قۆشمە.

**screamer** (skrēm′ẽr), *n.* (١) قیژەقیژكەر؛ قیژەكەر؛ هاواركەر.

(٢) [Slang]، كەسێك یا شتێكی زل، لێهاتوو، یا بەهێز... هتد.

(٣) [Slang]، كەسێكی زۆر قۆشمە؛ كەسێكە كەوا لە خەڵك دەكات بپچڕێن لە پێكەنیندا. (٤) [Slang]، نیشانەی سەرسامی (ڕێزمان، خاڵبەندی).

(٥) [Slang]، سەردێڕێكی وورووژێنەری ڕۆژنامە.

(٦) قیژەكەر: باڵندەیەكی ئاوی ئەمەریكای باشوورە قیژەی ناساز دەكات.

**screaming** (skrēm′iŋ), *adj.* (١) قیژەكەر؛ هاواركەر؛ قیژەقیژكەر.

(٢) زەق: سەرنج ڕاكێش؛ توندوتیژ. (٣) زۆر قۆشمە؛ زۆر خۆش‌و پێكەنیناوی.

**scree** (skrē), *n.* (١) چەو؛ وردە بەرد؛ زیخی درشت.

(٢) كۆمەڵە وردە بەرد یا چەوی دامێنی كەنەڵێك یا لێژگەیەك.

**screech** (skrēch), *v.i.* (١) شریخەكردن؛ قیژان؛ هاواركردن؛ زریكەكردن.

*v.t.* شریخە لێ هەڵسان؛ هاواركردن؛ زریكە لێ هەڵسان؛ قیژاندن.

*n.* شریخە: زریكە؛ قیژە؛ هاوار.

**-screecher** *(n.)* ; screechy *(adj.).*

**screech owl,** بایەقووش؛ كونەپەپوو.

**screed** (skrēd), *n.* (١) ووتارێكی دوورودرێژو ووشك‌و ناخۆش (بەتایبەتی هی سكاڵاكاری). (٢) نووسراوێكی پەخشانی دوورودرێژو ووشك.

(٣) پارچەیەك تەختەی باریكە بە ئەستوورایی ئەو سواغەی دەدرێ لە دیوار ناوبەناو دەخرێتە سەر دیوارەكە وەك نیشانەیەك بۆ ئەوەی ئەستووری سواغەكە وەك یەك دەرچێت (٤) ئامێرێكە نیشی ماڵە دەكات (بۆ ساف كردنی سواغی چیمەنتۆ).

**screen** (skrēn), *n.* (١) پەردە؛ بەربەست؛ پارێزەر؛ داپۆشەر؛ شوورە؛ تیغە دیواری جیاكەرەوە. (٢) بێژنگ؛ هێڵەك؛ تەلی بێژنگ‌و هێڵەك.

(٣) تەلی پەنجەرە؛ تەیمانەی پەنجەرە.

(٤) پەردەی سینەماو تەلەفزیۆن‌و ڕادار؛ پەردەی وێنە لەسەر پیشاندان

(٥) فیلمی سینەمایی بەگشتی؛ هونەری سینەماو فیلم.

(٦) (ا) پێشەنگی لەشكر (بۆ پاراستنی لەشكرەكە).

(ب) تاقمە كەشتی‌یەكی جەنگی بچووكە بەدەوری گەلە كەشتی باردا بۆ پاراستنی. (٧) ئامێری بەربەست (فیزیا).

*v.t.* (١) شاردنەوە (بە پەردە)؛ داپۆشین؛ پاراستن.

(٢) بێژانەوە؛ لە بێژنگ دان؛ ووردو درشت لەیەك جیاكردنەوە.

(٣) پاك‌و پیس كردن؛ جیاكردنەوە (بەپێی پێوانەیەكی تایبەتی وەك لێهاتوویی، كارامەیی، پلەی مەترسی...هتد)؛ لە بێژنگ دان (مەجاز):
*( to ~ applicants for a job ; Passengers entering a country are ~ed by customs officials.)*

(٤) تەل لێدان (پەنجەرە).

(٥) فیلمی سینەما پیشاندان (بەتایبەتی بۆ تاقیكردنەوە پێش پیشاندانی بۆ جەماوەر)؛ وێنە پیشاندان لەسەر پەردە.

(٦) وێنەگرتن بۆ فیلمی سینەما.

(٧) گۆڕینی چیرۆك یا شانۆنامەو گونجاندنی بۆ فیلمی سینەما

*v.i.* پیشان دران (فیلمی سینەما بەتایبەتی بۆ تاقیكردنەوە)؛ بۆ پیشاندان شیان

**screening** (skrēn′iŋ), *n.* (١) سەركۆزەر؛ كۆتەڵ.

(٢) تەلی پەنجەرەو دەرگا.

(٣) پیشاندانی فیلمی سینەما (بەتایبەتی بۆ تاقیكردنەوە).

**screen-land** (skrēn′land′), *n.* سینەماچێتی؛ جیهان‌و پیشەی فیلمی سینەما درووستكردن.

**screen-play** (skrēn′plā′), *n.* چیرۆكی سینەما (هەندێك جار یەكسەر بۆ فیلمی سینەما دەنووسرێ‌و هەندێك جاریش لە چیرۆك‌و شانۆنامەو داستانەوە وەردەگێڕدرێ). (پێشی دەووترێ: " scenario").

**screw** (skroo), *n.* (١) جەڕ؛ پێچ؛ بورغو؛ بورغی.

(٢) جەڕبادان؛ جەڕاندن؛ بادان؛ پێچ پیادان. (٣) پەروانە.

(٤) [Chiefly British]، (ا) كەسێكی پیسكە یا پوولەكی.

(ب) سەوداكەرێكی پوولەكی زۆرزان.

(٥) [British]، پاكەتە توتن.

(٦) [British]، ئەسپێكی پیری پەككەوتوو

(٧) [Slang]، پاسەوانی بەندیخانە.

(٨) [British Slang]، مووچە.

(٩) [Vulgar Slang]، (ا) گان؛ جووت بوون.

(ب) ئەو كەسەی لەگەڵی جووت دەبێت؛ هاوجێ: *( She is a good ~ .)*

*v.t.* (١) جەڕاندن؛ جەڕبادان؛ بادان.

(٢) قایم كردن بە جەڕ؛ ووشین؛ بە جەڕ بەستنەوە یا توندكردن.

(٣) تێكدان؛ شێواندن؛ چرچ‌ولۆچ كردن؛ خواروخێچ كردن (دەم‌وچاو)
*( to ~ one's face up)*

(٤) زۆرلێكردن؛ بەگێرهێنان؛ هەڵپێچان؛ زۆر بۆ هێنان.

(٥) بە زۆر لێسەندن؛ لێ كێشانەوە (پارە)؛ فێڵ لێكردن؛ گزی لێكردن.

(٦) [Slang]، ( ~ up)، تێكدان (كار)؛ بە خراپی‌و ناڕێك‌وپێكی كردن:
*( He ~s up everything he does.)*

(٧) [Vulgar Slang]، گاین؛ جووت بوون لەگەڵ.

*v.i.* (١) با دەدرێ؛ بە جەڕ پێكەوە دەبەسترێ: *( The lid ~s on.)* .

(٢) با دەخوات وەك جەڕ؛ پێچی پێ دەدرێت؛ پێچ دەخوات.

(٣) بە زۆرو بە فێڵ پارە لێسەندن یا كێشانەوە.

(٤) [Vulgar Slang]، گان كردن؛ گاین؛ جووت بوون لەگەڵ.

**have a screw loose, [Slang],** شێتە؛ سەری لێداوە؛ ڕەووشتی سەیر دەنوێنێ؛ سەیرە: *( He has a screw loose.)* .

**put the screws on ( or to ),** زۆرلێكردن؛ هەڵپێچان؛ زۆر بۆ هێنان؛

بەگیرهێنان؛ تەنگ پێ هەڵچنین
**screw out of,** [Slang]. بە زۆرو بە فێڵ پارە لێسەندن یا کێشانەوە.
**screw up,** [Slang]. تێکدان (کار)؛ بە نەزانانەو نارێکوپێکی شت کردن.
**screwball** (skrōō′bôl′), *n.* (١) تۆپی لابەلا ڕۆیشتوو (یاری بێسبۆل).
(٢) [Slang]، کەسێکی سەیرو هەوەسبازو حولحوڵی و شێتۆکە.
*adj.* سەیر؛ شێتۆکە؛ هەوەسباز؛ حولحوڵ؛ مێشک سووک.
**screw bean,** لۆبیای پێچ پێچۆکە: (ا) درەختێکە کەلووی پێچ پێچۆکە دەگرێت بۆ ئالیکی وولاخ. (ب) بەری ئەم درەختە.
**screw-driver** (skrōō′drīv′ẽr), *n. Also* **screw driver.** (١) جەڕبادەر (٢) خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە لە ڤۆدگاو ئاوی پرتەقاڵ دەکرێت.
**screw eye,** جەڕێکی ئەڵقەدارە قفڵو شتی تری پیادەکرێت
**screw hook,** جەڕێك یا ئاسنێکی قولاپدارە دەرگاو پەنجەرەی پێ دادەخرێت.
**screw jack,** = jackscrew.
**screw pine,** چەند جۆرە دەوەن و درەختێکی ناوچە گەرمەکانن گەڵاکانیان پێچ پێچۆکییەو ڕەگەکانیشیان بەدەرەوەیە.
**screw propeller,** پەروانە
**screw thread,** ددانی پێچ پێچۆکەی جەڕ.
**screwy** (skrōō′i), *adj.* [Slang]. (١) شێتۆکە؛ شێت؛ مێشک سووک؛ مێشک تێکچوو (٢) نابەجێ؛ بێ مانا؛ ناچێت بە مێشکدا؛ سەیر.
**scribal** (skrīb′'l), *adj.* (١) تایبەتی بە نووسەر
(٢) تایبەتی بە نووسینەوە؛ لە ئەنجامی نووسینەوەدایە: *( a ~ error)*.
**scribble** (skrib′'l), *v.t.* (١) بە پەلەو لامسەرلایی نووسین؛ بە قلی بلی نووسین: *( He ~d a note on a piece of paper.)*.
(٢) بە نووسین و شتی بێ ماناو قلی بلی کاغەز ڕەشکردنەوە
*v.i.* بە پەلەو لامسەرلایی نووسین؛ بە قلی بلی نووسین.
*n.* (١) نووسینی قلی بلی؛ نووسینی پەلەو لامسەرلایی و بەحاڵ سەر لێ دەرکراو.
(٢) نیشانەو هێڵی بێ مانای کاغەز پێ ڕەشکراوە.
(٣) بەرهەمێکی وێژەیی هیچ وپووچ.
**scribbler** (skrib′lẽr), *n.* (١) قلی بلی نووس؛ کەسێکی دەسخەت ناخۆش (٢) نووسەرێکی گەندو هیچ وپووچ
**scribe** (skrīb), *n.* (١) نووسەر (بەتایبەتی ڕۆژنامەچی).
(٢) دەستنووسیار: نووسیار؛ دەستنووس نووسەرەوە بە جوانی.
(٣) نووسەری فەرمانگە؛ میرزا. (٤) **scriber**.
(٥) دادگەر یا زانای ئاینی جوولەکەی کۆن.
*v.t.* (١) نیشانەکردنی بەردو خشت و دار بە ئامێرێکی نووک تیژ لەو شوێنەدا کە دەبڕرێتەوە. (٢) نووسین؛ لەسەر نووسین.
*v.i.* دەستنووس نووسینەوە (بە پیشە پێش پەیدابوونی چاپەمەنی)؛ دەستنووسیاری کردن.
**scriber** (skrīb′ẽr), *n.* ئامێرێکی نووک تیژە بۆ نیشانەکردنی بەردو خشت و دار بە هێڵێك لەو شوێنەدا کە دەویسترێ ببڕرێتەوە.
**scrim** (skrim), *n.* کالایەکی ئەختێك شاشی لۆکەیە (بۆ پەردەو بەرگ تێگرتن).
**scrimmage** (skrim′ij), *n.* (١) پێکامەڵپڕان؛ شەڕەشەق؛ زرموکوت؛ زۆرابازی (٢) مەشقی نێوان هەمان تیپ لەپێش یاریدا.
**scrimp** (skrimp), *v.t.* (١) بە کەموکووڕی دروستکردن لەبەر ڕەزیلی؛ زۆر دەست بە شتەوە گرتن و بە باشی دروست نەکردن
(٢) ڕەزیلی (لەگەڵ) کردن؛ پیسکەیی کردن؛ بەرچاوتەنگی کردن
*v.i.* ڕەزیلی کردن؛ پیسکەیی کردن؛ بەرچاوتەنگ بوون.
*adj.* کەم (بەهۆی بەرچاوتەنگییەوە)؛ بەش ناکات.
**scrimpy** (skrim′pi), *adj.* (١) کەم (بەهۆی بەرچاوتەنگییەوە)؛ بەش ناکات. (٢) پیسکە؛ ڕەزیل؛ پارەپیس
-**scrimpily** *(adv.)* ; **scrimpiness** *(n.)*.
**scrimshaw** (skrim′shô′), *n.* (١) نەقش ونیگار دروستکردن لەسەر سەدەف و گوێچکەماسی (لەلایەن کەشتیوانەوە لە گەشتی دووردا).
(٢) سەدەف و ئێسقانی نەهەنگ و گوێچکەماسی نەقش ونیگار لەسەرکراو بەم جۆرە. (٣) کارێکی ووردی بە شارەزایانە کراو.
*v.t. & v.i.* نەقش ونیگار دروستکردن لەسەر سەدەف و گوێچکەماسی.
**scrip** (skrip), *n.* [Archaic], جانتای بچووکی دەست؛ جزدان؛ هەگبە یا کەشکۆڵی بچووك.
**scrip** (skrip), *n.* (١) پارچە نووسراوێك؛ لیستە؛ خشتە؛ بڕوانامە؛ ڕەسید.
(٢) پارچە کاغەزێکی بچووك (بەتایبەتی کە شتی تێدا نووسرابێت).
(٣) قەواڵەی دارایی. (٤) پارەی کاغەزی لە دۆلار کەمتر (بەتایبەتی کە لە ناکاودا دەرکرێت بۆ کاتێکی سەردەمی).
**script** (skript), *n.* (١) (ا) دەسخەت؛ دەستنووس؛ نووسین.
(ب) نووسینی پێکەوەلکاو. (ج) ئەلف وبێ.
(٢) (ا) چاپی وەك دەسخەت. (ب) شتێکی چاپکراو.
(٣) دەقی یەکەمی بەڵگەنامەیەك (نەك وێنەکەی).
(٤) دەقی چیرۆکی فیلمی سینەمایی یا شانۆ؛ بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن.
*v.t.* نووسین و ئامادەکردنی چیرۆکی سینەما.
**scriptorium** (skrip-tôr′i-əm, skrip-tō′ri-əm), *n.* ژووری نووسینەوەی دەستنووس (لە پەرستگای ووشکەسۆفییانی خاچ پەرستاندا).
**scriptural** (skrip′chẽr-əl), *adj.* (١) نووسراو؛ تایبەتی بە شتی نووسراو. (٢) [S-]، ئینجیلی؛ بەپێی ئینجیل؛ لە ئینجیلدایە.
-**scripturally** *(adv.)*.
**Scripture** (skrip′chẽr), *n. Also* **Scriptures,** (١) دەستنووس؛ شتی نووسراو؛ بڕوانامە. (٢) [S-]، ئینجیل؛ ئینجیل و تەورات
(ڕێنی دەووتری: " **Holy Scripture** " وە " **the Holy Scriptures** ").
(٣) [S-]، [Rare]، بەندێك یا بەشێکی ئینجیل.
(٤) پەڕتووکێکی ئاینی پیرۆز.
**scrivener** (skriv′nẽr, skriv′'n-ẽr), *n.* [Archaic]. (١) نووسیار؛ دەستنووس نووسەرەوە بە جوانی؛ نووسەر. (٢) **notary** .
**scrobiculate** (skrō-bik′yoo-lit), *adj.* چاڵ وچۆڵاوی (زیندەوەرزانی، ڕووەکناسی)؛ دێراودار؛ چرچ ولۆچاوی؛ چاڵ چاڵاوی.
**scrod** (skrod), *n.* بەچکە ماسی " کۆد": ماسییەکی دەریایی گۆشت تورتە.
**scrofula** (skrof′yoo-lə), *n.* دەردەباریکە؛ سیلی لووی لمفاوی مل؛ دیق (پێشی دەووترێ: " **King's evil** " و " **struma** ").
**scroll** (skrōl), *n.* (١) لوولە کاغەز یا کاغەزی زەل و پێستەی شت لەسەر نووسراو (بەتایبەتی بڕوانامە).
(٢) پەڕتووکی کۆنی لەسەر لوولە کاغەزو کاغەزی زەل و پێستە نووسراو
(٣) لیستەی ناو (کە لەسەر لوولە کاغەز نووسرابێت).
(٤) (ا) نەقش ونیگاری پێچ پێچۆکەی پایەی یۆنانی کۆن (خانووسازی)
(ب) نەقش ونیگاری پێچ پێچۆکەی ئیمزا ڕازێنەوە.
(٥) سەری پێچ پێچۆکەی کەمانچە.
*v.t.* (١) لوولەکردن؛ پێچانەوە.
(٢) بە نەقش ونیگاری پێچ پێچۆکە ڕازاندنەوە.
*v.i.* لوولەکردن.
**scroll saw,** مشاری تەختە بڕینەوە بە پێچ پێچۆکەیی بۆ جوانی.
**scroll-work** (skrōl′wũrk′), *n.* نەقش ونیگاری ڕازێنەوەی پێچ پێچۆکە.
**scrooge** (skrōōj), *n.* کەسێکی پیسکە، بەرچاوتەنگ، یا ڕەزیل.
**scrotal** (skrō′t'l), *adj.* هی کیسەی گون.
**scrotum** (skrō′təm), *n.* کیسەی گون؛ پێستی گون.
**scrounge** (skrounj), *v.t. & v.i.* [Slang], ئاخونەك کردن؛ مووشەکردن؛ دزین؛ سواڵکردن؛ بە دزی و سواڵ و مەرایی دەربردن؛ مڕوموش کردن.
-**scrounger** *(n.)*.
**scrub** (skrub), *n.* (١) (ا) دارودەوەنی باریکەلە یا ڕیوەڵە.
(ب) کۆمەڵێك دارودەوەنی گەنگ و باریکەلەو بەیەکداچوو.

(ج) پەڵە زەوی داپۆشراو بەم جۆرە داروەوەنە.
(٢) گیانەوەر، ڕووەك، یا شتێکی گەنگ و نارەسەن و ناشرین.
(٣) کەسێکی کورتەبنە و بێ بایەخ.
(٤) (ا) گەنگ یاریکەری وەرنەگیراو لە تیپی وەرزشدا.
(ب) دەستەیەك یاریکەری وەها.

**scrub** (skrub), *v.t.* (١) بە قایم فڵچە و سابوون لێخستن یا کڕاندن بۆ پاك کردنەوە؛ هەڵگلۆفین بە توند: *( to ~ pots and pans, floors, etc.)* .
(٢) پاك کردنەوە بە کڕاندن و فڵچە لێخستن؛ پیسی لێکردنەوە بەم جۆرە.
(٣) بە توند لێخستن یا هەڵکڕاندن.
(٤) گاز پاك کردنەوە (لەڕێی کیمیاگەرییەوە).
(٥) [Slang]، هەڵوەشاندنەوە؛ پووچکردنەوە؛ نەکردن:
*( to ~ a plan, meeting, etc.)*
*v.i.* پاك کردنەوە بە فڵچە و سابوون لێخستن بە قایم یا هەڵکڕاندن.
*n.* (١) پاك کردنەوە بە فڵچە و سابوون لێخستن بە قایم یا هەڵکڕاندن.
(٢) کەسێکە کە ئیشی قورس و وشك و ناخۆش دەکات و بە کولەمەرگی دەژی.

**scrubber** (skrub'ẽr), *n.* (١) پاککەرەوەی زەمینەی خانوو و کەشتی بە فڵچە و سابوون. (٢) فڵچەی زبر (بۆ بەڵغ و شتی ڕەق هەڵکڕاندن لە دەفرو زەمینە هتد). (٣) ئامێری گاز پاك کردنەوە (کیمیاگەری).

**scrub brush,** فڵچەی زبر؛ فڵچەی کڕاندن

**scrubby** (skrub'i), *adj.* (١) کورتەبنە؛ ڕیوەڵە؛ بچووك؛ گەند.
(٢) لە داروەوەنی بچووك و ڕیوەڵە پێکهاتوو؛ بە داروەوەنی ڕیوەڵە داپۆشراو.
(٣) پەڕیووت؛ پیس و پۆخڵ؛ هیچ و پووچ؛ کەم؛ بچووك.

**scrub oak,** داربەڕووە کورتەباڵای ئەمەریکی

**scrub pine,** جۆرە کاژ یا سنەوبەرێکی ڕیوەڵە و کورتەباڵای ئەمەریکییە بەرە قوو چەکییەکەی دڕکاوییە.

**scrub-woman,** *n.* = charwoman.

**scruff** (skruf), *n.* پشتی مل؛ چەرمی پشت مل (بۆ ڕاکێشان وەك بزن و مەڕو مرۆڤ): *( to take by the ~ of the neck)* .

**scruffy** (skruf'i), *adj.* شڕووڕ؛ پیس و پۆخڵ؛ چەپەڵ؛ پنتی؛ قژبژو دانەهێنراو.

-**scruffily** *(adv.)* ; **scruffiness** *(n.)*.

**scrummage** (skrum'ij), *n. Also* **scrum,** هەڵوێستێکە لە یاری " ڕەگبی " ئینگلیزیدا بریتییە لە وەستانی یاریکەرەکانی هەردوو تیپەکە بەرامبەر یەکتری و سەردانەواندنیان و شەڕەشان کردن لەگەڵ یەکتری بۆ سەندنی تۆپەکە

**scrumptious** (skrump'shəs), *adj.* [Slang], زۆر خۆش (خواردەمەنی)؛ نایاب: *( a ~ meal, dinner, etc.)* .

**scrunch** (skrunch), *v.t. & v.i.* (١) کرۆشتن؛ داکرمان؛ هاڕین.
(٢) (~ up)؛ شان کووڕکردن؛ کۆمانەوە.
*n.* خرمەخرم؛ خرمە؛ دەنگی کرۆشتن؛ خرم وهووڕ؛ داکرمان.

**scruple** (skrōō'p'l), *n.* (١) نەختان؛ تۆسکاڵ؛ نەخت.
(٢) کێشانەیەکی کۆنی بچووکی ڕۆمانەکانە.
(٣) کێشانەیەکی زۆر بچووکی دەرمانگەرییە بریتییە لە قورسایی بیست دەنکە گەنم یا ١,٢٩٥ گرام.
(٤) دوودڵی (دەربارەی کردن یا نەکردنی کارێك لەبەر بەویژدانی)؛ ڕاڕایی؛ ویژدان *( a man of ~s ; He has no ~s.)* .
*v.t. & v.i.* دوودڵی کردن دەربارەی کردن و نەکردنی کارێك بەهۆی ویژدانەوە؛ ترسان یا سڵ کردنەوە (لەبەر بەویژدانی).

**scrupulosity** (skroo'pyoo-los'ə-ti), *n.* (١) بەویژدانی؛ دوودڵی یا ڕاڕایی (دەربارەی کردن یا نەکردنی شتێك لەبەر بەویژدانی).
(٢) کارێکی بەویژدانانە؛ نموونەیەکی بەویژدانانە.

**scrupulous** (skrōō'pyoo-ləs), *adj.* (١) بەویژدان؛ پاك؛ ڕاست.
(٢) وورد (لە ئیش وکاردا)؛ بەویژدان لە ئیش وکاردا.
*( a ~ worker, judge, person, etc.)*
-**scrupulousness** *(n.)*.

**scrupulously** (skrōō'pyoo-ləs-li), *adv.* بەویژدانانەوە (لەڕووی ووردی و پاکییەوە لە ئیش وکاردا)؛ زۆر وورد:
*( He did his job ~ .)*

**scrutable** (skrōō'ti-b'l), *adj.* لێکدەدرێتەوە؛ تێگەیشتنی بۆ هەیە لەڕێی لێ ووردبوونەوە و لێکۆڵینەوەوە.

**scrutinize** (skrōō't'n-īz'), *v.t.* لێ ووردبوونەوە؛ بە ووردی تێڕوانین یا پشکنین؛ بەووردی لێکۆڵینەوە.

**scrutiny** (skrōō't'n-i), *n.* (١) لێ ووردبوونەوە؛ لێکۆڵینەوە بە ووردی؛ پشکنین؛ بە ووردی تێڕوانین. (٢) سەیرکردنێکی وورد. (٣) چاودێری کردن (٤) تێڕوانین و دەنگ ژماردن (هەڵبژاردنی گشتی).

**scuba** (skōō'bə), *n.* ئامێری هەناسەدانی مەلەوانی ژێر ئاو.

**scud** (skud), *v.i.* (١) بە تیژی ڕۆیشتن؛ خێرا ڕۆیشتن یا ڕاکردن؛ بە خشپە ڕۆیشتن (هەر وەك شتێك پاڵی پێوە بنێت).
(٢) بە هێزی با ڕۆیشتن (کەشتیوانی)؛ ڕافڕێنران بە با؛ پاڵ پێوەنران بە با.
*n.* (١) بە تیژی ڕۆیشتن؛ بە خشپە چوون؛ ڕاکردن؛ ڕافڕان.
(٢) (ا) هەور یا بارانی بابردوو؛ باران بە باوە.
(ب) تاوە بارانێکی سووك و کوتوپڕ.

**scudo** (skōō'dō), *n.* پارەیەکی زێڕ یا زیوی ئیتاڵی کۆنە.

**scuff** (skuf), *v.t.* (١) پێ لەزەوی خشاندن لە ڕۆیشتندا.
(٢) سوواندنی ڕووی زبر؛ سوواندن و تەنك کردنی ڕووی شتێك.
(٣) بە ناستەم بەرکەوتن یا لێخشان لە ڕۆیشتندا.
*v.i.* پێ لە زەوی خشاندن لە ڕۆیشتندا.
*n.* (١) دەنگی قاچ ڕاکێشان بە زەویدا؛ پێ لە زەوی خشان لە ڕۆیشتندا
(٢) پەڵەیەك یا شوێنێکی سواو و تەنك بوو. (٣) سۆڵ.

**scuffle** (skuf''l), *v.i.* (١) بەیەکدا هەڵپرژان؛ بەیەکداهاتن؛ شەڕە مستەکوڵە کردن؛ لەیەکتردان؛ چوون بەگژ یەکدا.
(٢) پێ لە زەوی خشاندن لە ڕۆیشتندا.
*n.* (١) شەڕە مستەکوڵە؛ بەیەکدا هەڵپرژان؛ لەیەکتردان؛ بەگژ یەکدا چوون
(٢) پێ لە زەوی خشان لە ڕۆیشتندا.

**scull** (skul), *n.* (١) سەوڵی پشتەوەی بەلەم.
(٢) یەکێکە لە دوو سەوڵی کورت کە هەمان سەوڵ لێدەر بەکاری دەهێنێت
(٣) بەلەمێکی سەوڵی پێشبڕکێی سووك و باریکە (بۆ یەك سەوڵ لێدەر یا دوو).
*v.i. & v.t.* سەوڵ لێدان؛ بەلەم ڕاندن بە سەوڵ.

**scullery** (skul'ẽr-i), *n.* ژووری قاپ وقاچاغ شۆردن و هەڵگرتن.

**scullion** (skul'yən), *n.* [Archaic], بەردەستی چێشتکەر؛ قاپ شۆر؛ شاگردی چێشتکەر.

**sculpin** (skul'pin), *n.* (١) جۆرە ماسییەکی دەریایی بێ پوولەکەی سەر زل لەم پانە. (٢) جۆرە ماسییەکی هەمان شێوەی ڕووبارە.

**sculptor** (skulp'tẽr), *n.* پەیکەرتاش؛ پەیکەرساز

**sculptress** (skulp'tris), *n.* پەیکەرتاشی ژن.

**sculpture** (skulp'chẽr), *n.* (١) پەیکەرتاشی؛ پەیکەرسازی.
(٢) پەیکەر.
*v.t.* (١) پەیکەرتاشین؛ پەیکەر درووستکردن.
(٢) بە شێوەی پەیکەر پیشاندان یا دەربڕین. (٣) بە پەیکەر ڕازاندنەوە.
(٤) گۆڕین یا داتاشینی ڕووی زەوی بە خورانەوە (سرووشت)؛ وەك پەیکەر لێکردن.
-**sculptural** *(adj.)* ; **sculpturally** *(adv.)*.

**sculpturesque** (skulp'chə-resk'), *adj.* پەیکەری؛ لە پەیکەر دەچێت؛ جوان و ڕێك وپێك؛ شۆخ: *( She has a ~ figure.)*

**scum** (skum), *n.* (١) کەفی پیس (لە ئەنجامی کوڵاندنی شتێك یا ترش بوونیدا). (٢) خڵتە و پیسی کانزای تواوە.
(٣) خڵتە؛ بەڵغ؛ پیسایی؛ گەنگ وگوو؛ تڵپە؛ سەرکۆزەر.
(٤) کەسێك یا خەڵکی پیس و بۆگەن و بێ نرخ؛ خڵتەی کۆمەڵ؛ گەندوگووی کۆمەڵ:
*( They are the ~ of the earth.; the ~ of society)*

*v.t.* کەفی پیس لێگرتن.
*v.i.* کەف کردن (بەتایبەتی هی پیس).
-scummy *(adj.)*.
**scumble** (skum′b'l), *v.t.* (١) (ا) لە زەقی ڕەنگێك یا تابلۆیەك کەمکردنەوە بە لێدانی ڕەنگێکی نەختێك تاریك یا مردوو.
(ب) لێدانی ئەم ڕەنگە تاریکە یا مردووە (نیگارکێشی).
(٢) کەمکردنەوەی زەقی هێڵ و ڕەنگی وێنەیەکی دەستی بە پەنجە لێخستن و مراندنی ڕەنگە زەقەکە.
*n.* (١) چینە بۆیەی نەختێك تاریك یا مردووی لە تابلۆی ڕەنگ زەق دراو بۆ کەمکردنەوەی ئەو زەقییە. (٢) کەمکردنەوەی زەقی تابلۆ بەم جۆرە.
**scup** (skup), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریاییە.
**scupper** (skup′ẽr), *n.* کونی ئاوەڕۆی تەنیشتی کەشتی.
*v.t.* [British Slang], لەپڕ پەلاماردان و قەلاچۆکردن؛ پەکخستن؛ بەزاندن؛ نوقوم کردن (کەشتی و کەشتیوانەکانی)؛ فەوتاندن.
**scuppernong** (skup′ẽr-nôŋ′), *n.* (١) جۆرێکە لە تریێ سپیکەی ئەمەریکی. (٢) شەرابی ئەم ترێیە
**scruf** (skũrf), *n.* (١) کرێشی سەر.
(٢) توێکی وشکەوەبووی گیاندار و ڕووەك؛ کرێش؛ توێژی وشکبووەوە.
**scurfy** (skũr′fi), *adj.* کرێشاوی (سەر)؛ بە توێکی وشکەوەبوو داپۆشراو؛ توێژدار.
**scurrile, scurril** (skũr′il), *adj.* [Archaic]. = scurrilous.
**scurrility** (skə-ril′ə-ti), *n.* (١) دەم پیسی؛ جوێن فرۆشی؛ بەدگۆیی.
(٢) جوێن؛ قسە یا کاری خراپ (هەندێك جاریش ناڕەوا).
**scurrilous** (skũr′i-ləs), *adj.* (١) دەم پیس؛ جوێن فرۆش؛ بەدگۆ؛ نزم (ڕەوشت). (٢) پیس؛ پڕ لە قسەی پیس؛ ناشرین (زمان)؛ نزم:
*( The newspapers made a ~ attack on the prime minister.)*
-scurrilously *( adv.)* ; scurrilousness *(n.)*.
**scurry** (skũr′i), *v.i.* بە هەڵەداوان ڕۆیشتن؛ هاتن و چوون بە جرت و فرت و پەلەپرووزێ؛ بە شپرزەیی شت کردن؛ هەڵپەکردن؛ ڕاکەڕاك کردن.
*n.* (١) ڕۆیشتن بە هەڵەداوان؛ شپرزەیی؛ هەڵپە؛ ڕۆیشتنی پەلەپەل و جرت و فرتانە؛ ڕاکەڕاك. (٢) دەنگی ئەم ڕۆیشتنە بە پەلەپەل و هەڵەداوان.
(٣) تاوە باران یا بەفری کورت. (٤) پێشبڕکێ یا غارغارێنێکی کورت.
**scurvy** (skũr′vi), *adj.* نامەرد؛ پیس؛ نزم؛ بێ نامووس:
*( a ~ trick, fellow, etc.)*
*n.* ئەسکەربووت؛ نەخۆشییەکە لە کەمی ڤیتامین " سی " و سەوزە و میوە خواردنەوە تووش دەبێت و دەبێتە هۆی بێ هێزی و کەم خوێنی و نەرم بوون و ئاوسان و خوێن لێهاتنی پووك.
**scurvy grass**, گیای ئەسکەربووت؛ گیایەکی گەڵا تاڵە بۆ چاکردنەوەی نەخۆشی ئەسکەربووت بەکاردەهێنرا لە کۆندا.
**scut** (skut), *n.* کلکی کورت و ڕەپ (وەك هی کەروێشك و ئاسك).
**scuttage** (skū′tij), *n.* باجی بریتی یا " بەدەل "؛ باجێکە لەباتی سەربازی کردن دەدرا لە ڕژێمی دەرەبەگێتیدا
**scutate** (skū′tāt), *adj.* (١) قەڵغانی (وەك هەندێ گەڵا کە لە ناوەڕاستەکەیەوە بە لاسکەکەیەوە نووساوە لەباتی قنگەکەی، واتە بنەکەی).
(٢) پوولەکەیی؛ بە پوولەکەی تیژ و ڕەق داپۆشراو (زیندەوەرزانی)؛ قاوغدار.
**scutch** (skuch), *v.t.* شیکردنەوەی لۆکە و جیاکردنەوەی لە تۆوەکە؛ هەلاجی کردن.
*n.* جیکەنە؛ مەکینەی جیاکردنەوەی لۆکە لە تۆوەکەی.
**scutcheon** (skuch′ən), *n.* (١) escutcheon . (٢) scute .
**scute** (skūt), *n.* قاووغ (وەك هی کیسەڵ)؛ پوولەکەی تیژ و گەورەی سەر لەشی هەندێك لە گیاندارە خشۆکەکان.
**scutellate** (skū′t'l-āt′), *adj. Also* scutellated. (١) پوولەکەیی؛ بە پوولەکەی تیژ و ڕەق داپۆشراو. (٢) قەڵغانی (ڕووەکناسی).
**scutellation** (skū′t'l-ā′shən), *n.* بە پوولەکە داپۆشران (وەك لاقی باڵندە)؛ پوولەکەی وەها بەگشتی.
**scutellum** (skū-tel′əm), *n.* (١) پوولەکە یا قاووغی هەندێك جانەوەر.
(٢) گەڵا یا ئەندامێکی تری قەڵغانیی ڕووەك.
**scutiform** (skū′ti-fôrm′), *adj.* = scutate.
**scutter** (skut′ẽr), *v.i. & n.* [Brtitish Colloq.], = scurry.
**scuttle** (skut′'l), *n.* (١) بەرچنە؛ زەمیلەی بن تەسك و دەم فراوان؛ سەبەتە. (٢) دۆڵکەی خەڵووز.
**scuttle** (skut′'l), *v.i. & n.* بە هەڵەداوان ڕاکردن (بەتایبەتی لە مەترسی)؛ بە پەلەپرووزێ و جرت و فرت ڕۆیشتن؛ ڕاکەڕاك کردن.
**scuttle** (skut′'l), *n.* (١) کونی کڵاوەدار یا قەپاغدار (لە دیوارێك یا سەربانێکدا). (٢) کونی سەرقاپدار (لە لاتەنیشتی کەشتی یا زەمینەکەیدا).
(٣) کڵاوەی کونێکی وەها؛ سەرقاپ؛ سەردەم.
*v.t.* (١) کون کردنە بنی کەشتی یا بەلەم.
(٢) نوقوم کردنی کەشتی یا بەلەم بەم جۆرە.
**scuttle-butt** (skut′'l-but′), *n.* (١) فوارەی ئاو خواردنەوە لە کەشتیدا. (٢) بەرمیلە ئاوی خواردنەوە لە کەشتیدا.
(٣) [Slang]، ووتووات؛ بەندوباو؛ قاو؛ قاوەقاو.
**scutum** (skū′təm), *n.* (١) قەڵغانی دارینی قایش تێگیراوی ڕۆمانی کۆن. (٢) [S-] کەلووی قەڵغان: ناوی کۆنەستێرەیەکە.
(٣) قاووغ (کیسەڵ، گیانداری ئاوی و خشۆك)؛ پوولەکەی ئەستوور و تیژ؛ قەڵغان.
**Scylla** (sil′ə), *n.* سیلە: بەردێکی ترسناکە لە دیوی ئیتاڵیا لە گەروئاوی " مەسینا " بەرامبەر گێژاوی " کاربیدس ".
**between Scylla and Charybdis,** لەنێوان دوو ئاگردا بوون؛ لەنێوان دوو مەترسیدا بوون؛ دارێك بەدەستەوەبوون هەردوو سەری گواوی بێت.
**sea** (sē), *n.* (١) (ا) زەریا؛ ئۆقیانووس. (ب) دەریا. (ج) دەریاچەی شیرین.
(٢) باری دەریا (لەڕووی هێمنی یا زریاناوییەوە):
| *a calm* ( or *rough*, or *high* ) *sea* |.
(٣) شەپۆلی زۆر زل.
(٤) شتێکە کە لە گەورەییدا لە دەریا بچێت؛ شتی بێ بن:
*( a ~ of debt, troubles, etc.)*
(٥) کەشتیوانی؛ ژیانی کەشتیوانی.
**at sea,** (١) (ا) لە دەریادا. (ب) لە گەشتی دەریادا.
(٢) حەپەساو؛ واق ووڕماو؛ سەرسوڕماو؛ وڕ؛ سەرسام ماو؛ سەر لێ شێواو.
**follow the sea,** کەشتیوانی کردن؛ بوون بە کەشتیوان.
**go to sea,** (١) بوون بە کەشتیوان؛ کەشتیوانی کردن.
(٢) چوون بۆ گەشتی دەریایی؛ گەشتی دەریایی کردن.
**put to sea,** دەست بە گەشتی دەریایی کردن؛ بەندەر بەجێهێشتن؛ ڕۆیشتن.
**sea anchor,** لەنگەری سەرئاو: لەنگەرێکی سەرئاوکەوتووە بەدوای کەشتییەوە بۆئەوەی کەشتییەکە لانەدات لەڕێی خۆی.
(پێشی دەوترێ: " drogue "، " drift anchor "، " drag anchor ")
**sea anemone,** گوڵاڵەی دەریا: گیاندارێکی لیقنی ئەبزۆکی دەرییاییە لە گوڵ دەچێت بە بەردەوە دەنووسێت کە دەستی لێوە دەدەیت خۆی کرژ دەکات و خۆی دەهێنێتەوەیەك.
**sea bass,** ماسییەکی ڕەشتاڵەی دەریایی پوولەکە زلی دەم پانە لە دەریای ئەتڵەنتیکدا هەیە.
**sea bird,** باڵندەی دەریایی: لەناو یا لەنزیك دەریاوە دەژی.
**sea biscuit,** پسکویتە ڕەقە.
**sea-board** (sē′bôrd′, sē′bōrd′), *n.* کەناری دەریا؛ ناوچە و زەمینی تەنیشت دەریا.
*adj.* کەنار دەریایی.
**sea-borne** (sē′bôrn′), *adj.* دەریایی؛ بە دەریادا گوێزراوە، گەیێنراو، یا هەڵگیراو: *( ~ trade)*.
**sea bread** = sea biscuit.
**sea breeze,** سروەی دەریا؛ شنە یا کزەبای دەریا.
**sea calf,** گوێرەکەی دەریا؛ مانگای دەریا.

**sea coast,** کەناری دەریا؛ ناوچەی تەنیشت دەریا.
**sea cow,** (١) مانگای دەریا. (٢) کەرکەدەنی دەریا. (٣) فیلی دەریا.
**sea cucumber,** خەیاری دەریا: گیانداریکی دەریایییە لە خەیار دەچێت پێستەکەی دڕکاوییە گەلێك شاخی هەستیار بەدەوری دەمییەوەیە.
**sea devil,** (١) devilfish . (٢) angelfish .
**sea dog,** (١) dog fish . (٢) sea calf . (٣) کەشتیوانی شارەزا.
**sea duck,** مراوی دەریایی. لە کەناری دەریادا دەژی.
**sea eagle,** سیسارکی دەریا: چەند جۆرە باڵندەیەکی ماسی خۆرن.
**sea elephant,** فیلی دەریا
**sea fan,** باوەشێنی دەریا: شیلانێکی باوەشێنییە.
**sea-farer** (sē′fâr´ēr), *n.* کەشتیوان؛ دەریاوان.
**sea-faring** (sē′fâr´iŋ), *adj.* دەریاوانی؛ تایبەتی بە کەشتیوان یا دەریاوان
*n.* (١) پیشەی دەریاوان؛ دەریاوانی؛ کەشتیوانی.
(٢) گەشتکردن بە دەریادا؛ گەشتی دەریا.
**sea fight,** جەنگی دەریایی؛ شەڕی دەریایی.
**sea-food,** *Also* sea food, ماسی و گوێچکەماسی؛ خواردنی دەریایی.
**sea-fowl** (sē′foul´), *n.* (١) باڵندەی دەریایی: هەر باڵندەیەك کە لە دەریا یا نزیك دەریا بژی. (٢) باڵندەی دەریایی بەگشتی.
**sea front,** بەردەمی دەریا: ئەو بەشەی شارێکە کە یەکسەر بەتەنیشت دەریاوەیە؛ بەشی کەناری دەریای شار.
**sea gauge,** قووڵایی پێویست بۆ سەرئاوکەوتنی کەشتی.
**sea-girt** (sē′gûrt´), *adj.* بە دەریا دەورەدراو.
**sea-going** (sē′gō´iŋ), *adj.* (١) بۆ گەشتی دەریا کراوە؛ گەشتی ناو دەریای پێ دەکرێت. (٢) sea-faring .
**sea-green** (sē′grēn´), *adj.* سەوزی شینکار
**sea gull,** باڵندەیەکی ئاوی سپی قاچ پەردەدارە ئەختێك لە کۆتر گەورەترە لە کەناری دەریادا دەژی. (هەروەها " gull ").
**sea hog,** = porpoise.
**sea horse,** (١) ئەسپی دەریا: ماسییەکی دەریایی بچووکە سەری لە هی ئەسپ دەچێت و پوولەکەکانی ڕەقن وەك ئێسقان. (٢) Walrus .
(٣) گیانەوەرێکی ئەفسانەیییە نیوەی ئەسپەو نیوەی ماسی.
(٤) شەپۆلی گەورە
**seal** (sēl), *n.* (١) مۆر؛ ئیمزا؛ دامغە.
(٢) لۆك: مۆری سوور؛ مێوی مۆرکردن.
(٣) ئامێری هەوابڕ یا گازبڕ.
(٤) پەیمان؛ بەڵێن.
(٥) نیشانە (بەڵێن یا مۆرکردن):
*( Their handshake was a ~ of friendship.)*
(٦) پوولی ڕازێنەرەوە: *( a Christmas ~ )* .
*v.t.* (١) مۆرکردن؛ مۆرلێدان؛ ئیمزاکردن؛ دامغەلێدان.
(٢) داخستن؛ لۆك کردن؛ مۆرکردن. (٣) پەسەندکردن (بە مۆرکردن).
(٤) پێدان؛ بەڵێن پێدان؛ بۆ دانان:
*( He has ~ed his estate to his son.)*
(٥) دوا بڕیار لەسەردان؛ خستن بە لایەکدا بە جۆرێك کە هەڵوەشانەوەی نەبێت؛ بڕینەوە *( His fate was ~ed.)*
(٦) (أ) بڕینەوە (ژنهێنان)؛ مۆرکردن. (ب) دان بەشوو.
**set one's seal to,** (١) مۆرکردن: مۆری خۆ لێدان؛ ئیمزاکردن.
(٢) پەسەندکردن.
**under seal,** مۆرکراو: لۆك کراو.
**seal** (sēl), *n.* (١) مانگای دەریا؛ گوێرەکە یا پەڵخی دەریا: گیاندارێکی شیردەری ماسی خۆرە پێستەکەی لووسە هەر چوارپەلی پەردەدارن لە سەوڵ دەچن. (٢) کەوڵ یا پێستەی ئەم گیاندارە.
(٣) چەرمی دروستکراو لەم کەوڵە.
*v.i.* مانگای دەریا ڕاوکردن.

**sea lavender,** چاران چەقیلەی دەریا: لە زەلکاوی سوێردا دەڕوێت.
**sea legs,** توانای بە ڕێکی ڕۆیشتن بەسەر کەشتیداو بەملاو ئەولادا نەکەوتن لەکاتی زریاندا.
**sealer** (sēl′ēr), *n.* (١) مۆرکەر؛ لۆككەر؛ داخەر
(٢) بۆیەیەکە لە دیوار دەدرێت پێش بۆیەکردنی (بۆ پڕکردنەوەی کونوکەلەبەر)
(٣) فەرمانبەرێکە پێوانەو کێشانە تاقی دەکاتەوەو ڕاستەکانیان مۆر دەکات، واتە پەسەند دەکات.
**sealer** (sēl′ēr), *n.* (١) ڕاوچی مانگای دەریا.
(٢) کەشتی ڕاوی مانگای دەریا.
**sealery** (sēl′ēr-i), *n.* (١) ڕاوی مانگای دەریا.
(٢) جێ ڕاوی مانگای دەریا.
**sea lettuce,** کاهووی دەریا: گیایەکی دەریایییە گەڵاکەی دەخورێت.
**sea level,** ئاستی دەریا: لە پێوانی بەرزیی و قووڵیدا بەکاردەهێنرێت.
**sealng wax,** مۆری سوور (بۆ شت مۆرکردن)؛ لۆك.
**sea lion,** شێری دەریا.
**seal ring** = signet ring.
**seal-skin** (sēl′skin´), *n.* (١) پێستەی مانگای دەریا.
(٢) بەرگی دروستکراو لەم پێستەیە.
**seam** (sēm), *n.* (١) تیك (دروومان)؛ شیرازە.
(٢) (أ) هێڵی لێکدانی دوو شت (وەك تەختەدار)؛ هێڵ یا شوێنی نێو لێواری دوو شتی لێکدراو. (ب) شوێنی برین دوورینەوە.
(ج) بزماتە؛ شوێن برین؛ جێی کۆنە برین.
(٣) درز؛ قڵیش؛ چرچ. (٤) چینە خەڵوون، بەرد، یا کانزا.
*v.t.* (١) تیك گرتن؛ شیرازە گرتن؛ هەڵدوورین.
(٢) نیشانەکردنی نێوان دوو شت بەهێڵ؛ چرچ کردن
(٣) تەریب زەرکەش کردن؛ تەریب ڕازاندنەوە بە ڕیزە قوڵفە.
*v.i.* (١) درزبردن؛ شەق بردن؛ قڵیش بردن.
(٢) [Dial.]، دوورینەوە.
(٣) تەریب زەرکەش کردن؛ تەریب ڕازاندنەوە بە ڕیزە قوڵفە.
**sea-maid,** *Also* sea-maiden, بانوخوای دەریا.
**seaman** (sē′mən), *n.* (١) کەشتیوان؛ دەریاوان
(٢) سەربازی هێزی دەریایی.
**seaman-like** (sē′mən-līk´), *adj.* وەك کەشتیوانێکی باش؛ بۆ کەشتیوان شیاو.
**seamanship** (sē′mən-ship´), *n.* کەشتیوانی؛ دەریاوانی؛ پیشەی کەشتیوان.
**sea-mark** (sē′märk´), *n.* (١) نیشانەی بەرزاو (لە کەناردەریادا).
(٢) نیشانێکی زۆر لەبەرچاو لە کەناردەریادا بۆ ڕابەری کەشتیوانان (وەك: چراخان یا منارەی کەنار دەریا).
**sea mew** = sea gull.
**seamless** (sēm′lis), *adj.* (١) یەك پارچە؛ بێ تیك (٢) نەگۆڕ.
**seamstress** (sēm′stris), *n.* بەرگدرووی ژن.
**seamy** (sēm′i), *adj.* (١) تەقەڵو کەموکووڕییەکانی هەموو دیارە (وەك دیوی ژێرەوەی جلوبەرگ)؛ تەقەڵەکانی بەدەرەوەیە.
(٢) ناشرین؛ ناپەسەند؛ پیس؛ خراپ: *( the ~ side of life)*
**séance** (sā′äns), *n.* (١) کۆڕ؛ کۆبوونەوە.
(٢) کۆڕگرتن لەگەڵ گیانی مردوودا؛ دانیشتنێکە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ گیانی مردوواندا.
**sea otter,** دەڵەکی دەریا: گیاندارێکی دەریایی شیردەری پەل تەنراوی قاوەیییە کەوڵەکەی بەنرخە.
**sea-plane** (sē′plān´), *n.* فڕۆکەی ئاوی: لەسەر ئاو دەنیشێتەوەو دەفڕێ.
**sea-port** (sē′pôrt´, sē′pōrt´), *n.* بەندەر.
**sea power,** (١) هێزی دەریایی.
(٢) وڵاتێکی بەهێز لە دەریادا؛ وڵاتێکە کە هێزی دەریایی گەورەی هەبێت

**sea-quake** (sē′kwāk′), *n.* بوومەلەرزەی دەریا: لە بنی دەریادا ڕوودەدات
**sear** (sêr), *adj.* هەلقرچاو؛ ووشك؛ ووشكەوەبوو؛ سیس؛ هەلپرووكاو.
*v.t.* (١) ووشك كردنەوە. (٢) هەلقرچاندن؛ هەلكرووزان؛ سووتاندن؛ برژاندن. (٣) داخ كردن. (٤) هەست مراندن؛ ڕەق كردن (دڵ، هەست).
*v.i.* هەلقرچان؛ هەلكرووزان؛ سیس بوونەوە؛ ووشكبوونەوە.
*n.* شوێنی داخ كراو؛ سووتاوی؛ شوێنی سووتاو؛ جێ داخ.
**sear** (sêr), *n.* قفلی دڵنیایی یا سەلامەتی تفەنگ
**sea raven,** قەلەڕەشی دەریا: ماسییەكی گەورەی دەریایی بێ پوولەكەی سەر زل دەم پانە لە " **sculpin** " دەچێت.
**search** (sûrch), *v.t.* (١) پشكنین؛ گەڕان؛ بۆ گەڕان:
*( They ~ed the house for weapons.)*
(٢) پشكنین (مرۆڤ).
(٣) لێ وورد بوونەوە؛ لێكۆڵینەوە؛ گەڕان:
*( He ~ed his soul for the answer.)*
(٤) پیاچوون؛ لێوە چوونەژوورەوە.
*v.i.* بۆ گەڕان: بە شوێندا گەڕان؛ گەڕان
*n.* (١) پشكنین؛ گەڕان؛ بۆ گەڕان؛ بە شوێندا گەڕان؛ لێكۆڵینەوە؛ لێ ووردبوونەوە (٢) وەستاندنی كەشتی وولاتێكی بێ لایەن بۆ شتی قاچاخ لەلایەن كەشتی وولاتێكەوە كە لە جەنگدا بێت.
(ووشەی " **right of search** " ببینە).
**in search of,** بە شوێندا یا دوادا گەڕان بە هیوای دۆزینەوە؛ بە شوێندا؛ بەدوادا
**search out,** بۆ گەڕان و دۆزینەوە؛ بەدوادا گەڕان؛ سۆراخ كردن:
*( to search out an old friend)*
**searching** (sûr′chiŋ), *adj.* (١) وورد. پشكنین).
(٢) تیژ. جاو؛ دەڵێی بۆ شت دەگەڕێت: *( ~ eyes ; a ~ look)* .
(٣) سارد. تیژ *( the ~ wind)* .
**search-light** (sûrch′līt′), *n.* (١) تیشكی پشكنین؛ چرای پشكنین.
(٢) ئامێری سەرچاوەی ئەم تیشكە.
**search party,** تاقمی پشكنین؛ تاقمی پشكنین (بۆ كەسێك یا شتێكی وون بوو).
**search warrant,** فەرمانی پشكنین (كە دادپرس دەیدات بە پۆلیس بۆ پشكنینی ماڵێك، خانوویەك...هتد).
**sea robber** = pirate.
**sea robin,** جۆرە ماسییەكی سووركارە
**sea room,** فراوانی دەریا: ئەوەندە جێگە كە بەشی ڕانین و پێچكردنەوەی كەشتی بكات
**sea rover,** (١) كەشتی جەتەی دەریا. (٢) **pirate** .
**sea-salt** (sē′sôlt′), *n.* خوێی دەریا
**seascape** (sē′skāp′), *n.* (١) دیمەنی دەریا.
(٢) وێنە یا تابلۆی دیمەنێكی دەریا.
**sea scout,** دیدەوانی دەریا
**sea scorpion** = sculpin.
**sea serpent,** ماری دەریا: (أ) گیاندارێكی گەورەیە لە مار دەچێت و گوایە لە دەریادا دەژی بەلام هەرگیز بە تەواوی نەبینراوە.
(ب) ماری ژەهراوی دەریا.
**sea shell,** قاقلەی زیندەوەری دەریا.
**sea-shore** (sē′shôr′, sē′shōr′), *n.* كەناری دەریا
**sea-sick** (sē′sik′), *adj.* تووشی سەرەگێژەی دەریا بووە (بەهۆی سواربوونی كەشتی و بەلەمەوە).
**sea-sickness** (sē′sik′-nis), *n.* سەرەگێژەی دەریا؛ سەرەخولەی دەریا.
**sea-side** (sē′sīd′), *n.* كەناری دەریا؛ ناوچەی قەراغ دەریا.
*adj.* لە كەناری دەریادا؛ تایبەتی بە قەراغ دەریا.

**sea snake,** (١) ماری ژەهراوی دەریا. (٢) **sea serpent** .
**season** (sē′z'n), *n.* (١) وەرز: یەكێكە لەچوار وەرزی ساڵ.
(٢) كڕ؛ كەش: *( the planting ~ ; the harvest ~ )* .
(٣) كاتی ڕوودانی شتێك؛ باشترین كات بۆ ڕوودانی شتێك؛ هەرەت؛ وەرز؛ كڕ *( the fish ~ ; the orange ~ )*
(٤) سەردەم؛ ماوەیەكی كورت؛ ماوە.
(٥) كاتی جەژنێكی تایبەتی؛ كاتێكی تایبەتی:
*( the Christmas ~ ; the holiday ~ )*
*v.t.* (١) ترش و خوێ كردن؛ بەهارات پێوەكردن.
(٢) زیادەپێوەنان بۆ خۆشی و سەرنج ڕاكێشان (چیرۆك، دەنگوباس)؛ بەهارات پێوەكردن (مەجاز)
(٣) وازلێهێنان هەتا باش دەگات یا خۆش دەبێت (قاوورمە، شەراب، ترشیات).
(٤) ڕاهێنان؛ ڕاهاتن؛ فێربوون: *( He was ~ed to the hard life.)*
(٥) هێمنكردنەوە (ووتار، ووتە)؛ لە توندوتیژی كەمكردنەوە:
*( ~ your remarks with discretion.)*
*v.i.* گەیین (خواردن و خواردنەوە، شەراب، باسترمە، قاوورمە...هتد).
**for a season,** بۆ ماوەیەك؛ سەردەمێك.
**in good season,** زوو؛ نەختێك پێش كاتی خۆی بۆ دوانەكەوتن.
**in season,** (١) وەرزی خۆیەتی؛ كڕێتی؛ كاتی خۆیەتی؛ هەرەتێتی:
*( Crops are in season now.)*
(٢) لەكاتی خۆیدا؛ كاتی خۆیەتی؛ لە كاتێكی باشدا.
(٣) **in good season**
(٤) بەبا؛ بەكەڵ؛ بەتەگە؛ هاتنە تەگە.
**in season and out of season,** هەمیشە؛ هەمووكاتێك.
**out of season,** بەسەرچووە؛ وەرزی نییە؛ كاتی خۆی نییە:
*( Apples are out of season.)*
**seasonable** (sē′z'n-ə-b'l), *adj.* (١) لەگەڵ ئەو وەرزەدا گونجاو؛ ئاساییە بۆ ئەو وەرزە؛ چۆن چاوەڕوان دەكرێ لەو وەرزەدا وەها.
*( We've had ~ weather.)*
(٢) لەكاتی خۆیدا؛ بەجێ؛ بۆ ئەو كاتە باش:
*( He gave his foolish friend some ~ advice.)*
-seasonably *(adv.)*.
**seasonal** (sē′z'n-əl), *adj.* وەرزی؛ دەمەدەمی؛ بەگوێرەی وەرز:
*( Fruit-picking is a ~ occupation.)*
**seasoning** (sē′z'n-iŋ), *n.* (١) بەهارات؛ داوودەرمان؛ ترش و خوێ:
*( Salt and pepper are ~s.)*
(٢) داوودەرمان تێكردن؛ ترش و خوێ كردن.
**season ticket,** بلیتی وەرزی: بلیتێكە كە بۆ درێژایی وەرزێك هەر باشە بۆ شتی وەك سینەما و شانۆنامە و پاس و شەمەندەفەر...هتد.
**season squirt,** فیچقە دەریا: گیاندارێكی بچووكی دەریایی ئەبرزكە فیچقە ناو دەهاوێژێ كە دەستی لێوەدرا.
**sea-strand,** = sea-shore.
**sea swallow,** پەرەسێلكەی دەریا: باڵندەیەكە ئەوەندەی كۆترێكە.
**seat** (sēt), *n.* (١) شێوەی دانیشتن (وەك لە سواربوونی ئەسپدا).
(٢) جێی دانیشتن؛ جێ. (٣) كورسی؛ تەختەی دانیشتن؛ تەخت.
(٤) كەفەل؛ قنگ؛ سمت. (٥) قنگی پانتۆڵ یا شەرواڵ.
(٦) جێ قنگی كورسی؛ جێی قنگ خستنەسەری كورسی.
(٧) ئەندامێتی پەرلەمان یا ئەنجوومەنێك:
*( He has a ~ on the commission, in parliament, etc.)*
(٨) بن؛ بنی شت.
(٩) شوێنی خستنەسەری بنی شتێك؛ جێ بن.
(١٠) مەلبەند؛ بارەگا؛ شوێن؛ پایتەخت:
*( The ~ of government ; A university is a ~ of learning.)*
(١١) پایتەخت.
(١٢) نشینگە؛ ماڵ؛ خانووبەرە.

*v.t.* (١) دانیشاندن.
(٢) جێگەبوونەوە: *( The stadium ~s 10000 people.)* .
(٣) کورسی تیادانان؛ کورسی پینەکردن یا بەرگ تێگرتنەوە.
(٤) دامەزراندن (لەسەر کار)؛ دانان؛ خستنەسەر.
**be seated,** دانیشتن *( Please be seated.)* .
**seat oneself,** دانیشتن: *( Please seat yourself.)* .
**take a seat,** دانیشتن *( Won't you take a seat?)* .
**win a seat,** بردنەوە (هەڵبژاردنی پەرلەمان، ئەنجوومەنی شارەوانی).
**seat belt,** پشتێنی سەلامەتی (لە فڕۆکەو ئوتومبیلدا)؛ پشتێنی کورسی. (پێشی دەوترێ: " safety belt ").
**seater** (sēt′ēr), *n.* شتێکە کە ئەوەندە کورسی یا جێی دانیشتنی تێدابێت (فڕۆکە، ئوتومبیل): *( a two ~ ; a four ~ )* .
**seating** (sēt′iŋ), *n.* (١) کورسی تێدا دانان. (٢) بەرگی کورسی.
(٣) شێوەی دانانو ڕێکخستنی کورسی یا دانیشتنی خەڵك لە شوێنێکدا.
(٤) (أ) بن؛ بنی شت. (ب) جێی بن لەسەر دانان
**sea trout,** جۆرە ماسییەکی دەریایییە
**sea urchin,** ژیشکی دەریا.
**sea wall,** بەربەستی شەپۆل؛ دیواری پاراستنی کەناری دەریا لە خورانەوەی بە شەپۆل.
**sea-ward** (sē′wērd), *n.* لای دەریا؛ لای بەرەو دەریا.
*adj.* (١) بەرەو دەریا (٢) لە دەریاوە هەڵکردوو (با).
*adv.* بەرەو دەریا
**seawards** (sē′wērdz), *adv.* = seaward.
**seaware** (sē′wâr′), *n.* = seaweed.
**seaway** (sē′wā′), *n.* (١) ڕێگەی دەریایی
(٢) ڕۆیشتنی کەشتی بە دەریادا؛ بۆ پێشەوەچوونی کەشتی.
(٣) دەریا؛ دەریای فراوان. (٤) دەریای هەڵچوو یا زریاناوی.
(٥) ڕێگەی ئاوی، زێ، یا جۆگەیەکی گەورەیە کە لە دەریا جیابووەتەوەو بەکاردەهێنرێ بۆ هاتوچۆی کەشتی.
**seaweed** (sē′wēd′), *n.* گیای دەریا؛ قەوزەی دەریا.
**sea wolf,** (١) گورگی دەریا: چەند جۆرە ماسییەکی گەورەی دڕن. (٢) pirate
**sea-worthy** (sē′wûr′*th*i), *adj.* کەشتی بۆ چوونە دەریا؛ بەرگەی گەشتی دەریاو شەپۆلی توندوتیژ دەگرێ؛ قایم؛ باشە بۆ گەشت: *( a ~ vessel or ship)*
**-sea-worthiness** *(n.).*
**sea-wrack,** = seaweed.
**sebaceous** (si-bā′shəs), *adj.* (١) چەور؛ ڕۆنی؛ ڕۆن ئاسا.
(٢) ڕۆن دەردەر (لوو)؛ چەوری ڕژێن. (وشەی دوایی ببینە).
**sebaceous gland,** لووی چەوری (چەوری دەردەدات لە پێستدا)
**seborrhea, seborrhoea** (seb′ə-rē′ə), *n.* نەخۆشی چەوری زۆر دەردانی لووی چەورییە لە پێستدا
**sebum** (sē′bəm), *n.* ماددەیەکی چەورە لووی چەوری دەریدەدات لە پێستدا
**secant** (sē′kənt, sē′kant), *adj.* بڕ؛ بڕەر.
**secco** (sek′kô), *n.* وێنەکێشانی سەر گەچی ووشك.
**secede** (si-sēd′), *v.i.* جیابوونەوە لە وڵات؛ کشانەوە لە حیزب، ڕێکخراو، یا کۆمەڵێك: *( to ~ from a country)* .
**secern** (si-sûrn′), *v.t.* (١) لێك جیاکردنەوە؛ جیاوازی بینین (لە مێشکدا). (٢) [Rare]، دەردان؛ ڕژان (لوو)
**secernent** (si-sûrn′ət), *adj.* ڕژێن (لوو)؛ دەردەر.
**secernement** (si-sûrn′mənt), *n.* دەردان؛ ڕژان (لوو).
**secession** (si-sesh′ən), *n.* (١) جیابوونەوە لە وڵات.
(٢) [S-]، جیابوونەوەی وڵاتەکانی بەشی خوارووی ئەمەریکا لە ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٦٠دا کە بووە هۆی شەڕی براکوژی ئەمەریکی.

**secessionism** (si-sesh′ən-iz′m), *n.* جیابوونەوەخوازی (ناوچەیەك لە وڵاتێك)؛ بیروباوەڕی جیابوونەوەخوازیو جیابوونەوەخوازان.
**secessionist** (si-sesh′ən-ist), *n.* جیابوونەوەخواز؛ داواکاری جیابوونەوەی ناوچەکەی خۆی لە وڵات.
**seclude** (si-klōōd′, si-klūd′), *v.t.* (١) جیاکردنەوە؛ تەریك کردن؛ لێ بڕان؛ دابڕکردن. (٢) داپۆشین؛ لە خەڵك شاردنەوە.
**secluded** (si-klōōd′id, si-klūd′id), *adj.* (١) تەریك؛ چەپەك؛ دوور: *( a ~ meeting place)* .
(٢) گۆشەگیر؛ گۆشەنشین؛ تەنها؛ شاراوە.
-secludedness *(n.).*
**seclusion** (si-klōō′zhən), *n.* (١) (أ) جیاکردنەوە؛ تەریك کردن؛ دابڕین. (ب) گۆشەگیری؛ گۆشەنشینی؛ تەنهایی؛ خەڵوەت.
(٢) شوێنێکی تەریك یا چەپەك.
**seclusive** (si-klōō′siv), *adj.* (١) جیاکەرەوە؛ تەریککەر؛ دابڕکەر.
(٢) گۆشەگیر؛ گۆشەنشین؛ حەز لە تەنهایی کەر.
**second** (sek′ənd), *adj.* (١) دووەم؛ دووهەمین.
(٢) تر؛ هی تر؛ زیادە: *( We all took a ~ helping. ; for the ~ time)*
(٣) یەکێکی تری وەها؛ وێنە؛ هاوتا: *( There has been no ~ Shakespeare.)*
(٤) دووەم (پلە، بایەخ، باشی، دەسەڵات...هتد)؛ نمرە دوو.
(٥) خواردەست؛ خوارتر (پلە، دەسەڵات، چاکی...هتد)؛ شاگرد
(٦) نزمتر (مۆسیقا).
*n.* (١) دووەم؛ دووەمین. (٢) کەسێك یا شتێکی دووەم.
(٣) (*pl.*)، فرۆتەنی نمرە دوو؛ شتومەکی مام ناوەندی یا کەموکووڕیدار.
(٤) یاریدەدەر (بۆکسبازی، شیربازی)؛ شاگرد.
(٥) پاڵپشتی (پێشنیازێك بۆ دەنگ لەسەردانی لە کۆڕێکی پەرلەمانی یا تردا).
(٦) گێری دووەم (مەکینەی ئوتومبیل...هتد).
*v.t.* (١) یاریدەدان (بۆکسبازی، شیربازی)؛ شاگردی کردن.
(٢) پاڵپشتی کردن؛ پشتگرتن.
(٣) پەسەندکردن (پێشنیازێك بۆ دەنگ لەسەردانی لە کۆڕێکی پەرلەمانی یا تردا)؛ لایەنگرتن: *( to ~ a motion or proposal)* .
*adv.* دووەم (پلە)؛ دووەمین.
**second** (sek′ənd), *n.* چرکە (کات)؛ هەناسە؛ شەست یەکی ساتێك.
**Second Advent** = Second Coming.
**secondary** (sek′ən-der′i), *adj.* (١) دووەم (پلە، نمرە)؛ ناسەرەکی؛ کەم بایەخ. (٢) ناوەندی؛ ناوەنجی؛ ئامادەیی: *( ~ school)* .
(٣) ناسەرچاوەیی؛ ناسەربەخۆ: *( a ~ source)* .
(٤) تایبەتی بە پەڕی ناسەرەکی یا ژێرباڵ؛ هی ووردەپەڕ.
*n.* (١) کەسێك یا شتێکی ناسەرەکی؛ کەم بایەخ؛ نمرە دوو...هتد
(٢) یاریدەدەر؛ خواردەست؛ ژێردەستە.
(٣) ئەستێرەیەکە کە بەدەوری یەکێکی گەورەتردا دەسووڕێتەوە؛ مانگ.
(٤) یاریکەری پشتەوە (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
(٥) پەڕی ژێر باڵ؛ ووردەپەڕ.
**secondary accent,** گیرەی ناسەرەکی (دەنگناسی)؛ گیرەیەکی سووکە لە وشەیەکی چەند بڕگەییدا (وەك گیرەی سەر بڕگەی یەکەم لە وشەی " elementary " دا).
**secondary color,** ڕەنگی ناسەرەکی: ڕەنگێکە بە تێکەڵکردنی هاوتایی دوو ڕەنگی سەرەکی پێکدێت.
**secondary education,** خوێندنی ناوەندی؛ پەروەردەی ناوەندی (کە قوتابخانەی ناوەندی دەگرێتەوە).
**secondary school,** قوتابخانەی ناوەندی؛ قوتابخانەی ئامادەیی.
**second-best** (sek′ənd-best′), *adj.* دووەم (پلە، باشی)؛ نمرە دوو: *( He is the ~ writer, poet, player, singer, etc.)* .
**second childhood** = senility.

**second-class** (sek′ənd-klas′), *adj.* (١) نمره دوو؛ ڕەشۆکی؛ خواردەستە: ***( a ~ citizen)*** .
(٢) هی گەشتی نمره دوو: ***( a ~ railway carriage)*** .
(٣) هی پۆستەی نمره دوو (وەك بۆ ڕۆژنامەو گۆڤار...هتد).
***adv.*** (١) نمره دوو (گەشت)؛ بە نمره دوو: ***( We traveled to Europe ~ .)***
(٢) بە پۆستەی نمره دوو: ***( You can mail the magazine ~ .)*** .

**Second Coming,** دووەم هاتنی عیسا بۆ ئەم جیهانە (ئینجیل).

**second cousin,** ئامۆزازا؛ پوورزازا؛ خاڵۆزازا.

**second fiddle,** (١) (ا) کەمانچەی ناسەرەکی تیپی مۆسیقا.
(ب) ئەم کەمانچییە؛ کەمانچی ناسەرەکی.
(٢) (ا) دەوری ناسەرەکی (دڵداری، کاروبار)؛ خواردەستی؛ ژێردەستەیی.
(ب) کەسێکە کە ئەم دەورە دەبینێ؛ کەسێکی ناسەرەکی.
**to play ( or be ) second fiddle,** دەوری ناسەرەکی یا نمره دوو بینین (دڵداری، کاروبار)؛ خواردەستەبوون؛ گرنگ نەبوون.

**second-guess** (sek′ənd-ges′), *v.t.* (١) ڕەخنە لە بڕیار یا بڕیاردەر گرتن پاش ئەنجام دەرکەوتن؛ ڕەخنەگرتن پاش تەواوبوونی شت.
(٢) ڕەمڵ لێدان؛ هەڵهێنانی نیازو کرداری کەسێك پێشەکی.
***v.i.*** ڕەخنەگرتن لە بڕیار یا بڕیاردەر پاش ئەنجام دەرکەوتن.

**second-hand** (sek′ənd-hand′), *adj.* (١) ناڕاستەوخۆ ***( ~ information)***
(٢) نیوداشت؛ کۆنە؛ کۆن: ***( a ~ car)*** .
(٣) هی کۆنە یا نیوداشت (فرۆشگا): ***( a ~ clothing store)*** .
***adv.*** ناڕاستەوخۆ: ***( I heard the news ~ .)*** .

**second hand,** دەستی چرکەژمێر (کاتژمێر).

**second hand,** کەسێك یا سەرچاوەیەکی ناسەرەکی یا ناڕاستەوخۆ: ***( to hear something at ~ )***

**second lieutenant,** ئەفسەری یەك ئەستێرە

**secondly** (sek′ənd-li), *adv.* دووەم (هۆ یا ئەنجام ژماردن).

**second mate,** یاریدەدەری دووەمی کاپتن (کەشتی).

**second mortgage,** ڕەهنی دووەمی خانوو.

**second nature,** خوویەك یا کردەوەیەکە ئەوەندە چەسپیوە وەك تایبەخۆی زگماکی لێ هاتووە.

**second person,** ڕێژەی کەسی دووەم (ڕێزمان)؛ ڕێژەی کەسی ڕووبەڕوو یا قسەبۆکراو: (وەك: " you do " لەم ڕستەیەدا: " You do not know. ").

**second-rate** (sek′ənd-rāt′), *adj.* (١) نمره دوو؛ دووەم (پلە، چاکی، بایەخ ...هتد)
(٢) گەند؛ خراپ؛ ڕەشۆکی؛ بازاڕی: ***( a ~ actor)*** .

**second self,** گیانی دووەم. کەسێکە ئەوەندە نزیکە لە کەسێکی ترەوە وەك ئەوی لێ هاتووە.

**second sight** = clairvoyance.

**second-story man,** [Slang]. دزێکە کە لە پەنجەرەی نهۆمی دووەمەوە دەچێتە ژوورەوە.

**second thoughts,** ڕاگۆڕین (لە ئەنجامی زیاتر بیرکردنەوە لە شتێك): ***( I have ~ about going on the trip.)***

**second wind,** (١) هەناسە هاتنەوەبەر (پاش هەناسە لێ بڕان لە یاری یا ڕاکردندا): ***( to get a ~ )*** .
(٢) هێز هاتنەوەبەر (بۆ هەر کۆششێك).

**secrecy** (sē′krə-si), *n.* (١) نهێنێتی؛ پەنهانی؛ دزێتی.
(٢) نهێنی ڕاگرتن؛ نهێنی نەدرکاندن؛ نهێنیبازی؛ پەنهانبازی.

**secret** (sē′krit), *adj.* (١) نهێنی؛ پەنهان.
(٢) تەریك؛ چەپەك؛ دوور؛ گۆشەگیر؛ گۆشەنشین.
(٣) نهێنباز؛ پەنهانباز؛ نهێنی خۆ بە کەس نەووت.
(٤) لێڵ؛ نەزانراو؛ نادیار.
(٥) شاراوە؛ نەبینراو: ***( a ~ drawer)*** .
(٦) نهێنکار؛ نهێنی: ***( a ~ society; a ~ agent)*** .
***n.*** (١) شتێکی نهێنی؛ پەنهان؛ نهێنی؛ ڕاز.
(٢) شتێکی لێڵ یا شاراوەو هەمووکەس تێی نەگەیشتوو.
(٣) مەلأمەت؛ هۆی شاراوە یا نەزانراو: ***( ~s of success)*** .
(٤) [S-]، نوێژێکە لەژێر لێوەوە دەکرێ (خاچ پەرستی).
**in secret,** = secretly.

**secret agent,** سووسە؛ سیخوڕ؛ جاسووس؛ ڕازدۆز.

**secretarial** (sek′rə-târ′i-əl), *adj.* سکرتێری؛ تایبەتی بە سکرتێری فەرمانگە.

**secretariat** (sek′rə-târ′i-it), *n. Also* secretariate, (١)- سکرتاریەت: ***( ~ of the United Nations)*** .
(٢) بارەگا یا مەڵبەندی سکرتاریەت.

**secretary** (sek′rə-ter′i), *n.* (١) سکرتێری فەرمانگە.
(٢) سکرتێر (حیزب، ڕێکخراو، ئەنجوومەن...هتد)؛ ڕازگر؛ ڕازدار.
(٣) وەزیر (لە ئەمەریکادا)؛ شالیار.
(٤) مێزی نووسین کە دۆلابێکی بەسەرەوە بێت بۆ پەڕتووك.

**secretary bird,** باڵندەیەکی ئەفەریقایی گەورەی ملو لاق درێژی گۆشتخۆرە چەند شتێکی وەك قەفی پەڕ لە پۆپنەکەیەوە هاتووەتەدەرەوە لەسەر جانەوەرو گیاندارە خشۆکەکان دەژی.

**secretary-general** (sek′rə-ter′i-jen′ēr-əl), *n.* سکرتێری گشتی؛ ڕازگری گشتی.

**secretary of state,** وەزیری دەرەوە (ئەمەریکا).

**secretaryship** (sek′rə-ter′i-ship′), *n.* سکرتارێتی؛ ڕازداری؛ ڕازگری؛ پلەوپایەی سکرتێر.

**secrete** (si-krēt′), *v.t.* (١) شاردنەوە.
(٢) دەردان (هۆرمۆن، تەڕاو، جەوی...هتد)؛ تێ ڕژاندن؛ ڕژاندن؛ لە لەش کردنەدەرەوە.

**secretin** (si-krē′tin), *n.* هۆرمۆنێکە لە ڕیخۆڵەدا یارمەتی دەردانی پەنکریاس دەدات.

**secretion** (si-krē′shən), *n.* (١) شاردنەوە: ***( the ~ of stolen goods)***
(٢) دەردان (هۆرمۆن، تەڕاو، جەوی، شیلە...هتد)؛ تێ ڕژان؛ ڕژان: ***( the ~ of hormone)***
(٣) شتی دەردراو (هۆرمۆن، جەوی، ئارەق، میز، لیك...هتد).

**secretive** (si-krē′tiv), *adj.* (١) نهێنباز؛ پەنهانباز؛ هەستو ئەستی خۆ بۆ خەڵك نەدرکێن؛ نەکراوە: ***( a ~ person)*** .
(٢) **secretory** .

**secretly** (si-krē′t-li), *adv.* بە نهێنی؛ بە پەنهانی؛ بە دزییەوە.

**secretor** (si-krēt′ēr), *n.* لووی هۆرمۆن دەردەر؛ هۆرمۆن ڕژێن؛ ئەندامی دەردەر.

**secretory** (si-krē′tə-ri), *adj.* . دەردەر (هۆرمۆن، لیك، جەوی، شیلە...هتد)؛ تایبەتی بە دەردان یا تێ ڕژان؛ تێ ڕژێن.
***n.*** لووی هۆرمۆن دەردەر یا تێ ڕژێن؛ ئەندامی دەردەر.

**secret service,** (١) سووسەیی؛ جاسووسی؛ سیخوڕی.
(٢) [S- S-]، پۆلیسی نهێنی: دەزگایەکی پۆلیسو ئاسایشە ئەرکی پاراستنی سەرکۆماری ئەمەریکا و خێزانەکەیو میوانە بێگانە گەورەکانی سەرەك کۆماری پێ سپێردراوە.

**sect** (sekt), *n.* (١) تاقمی هاوبیروباوەڕ؛ دەستە؛ تیرە.
(٢) تاقم یا کۆمەڵی ئاینی؛ تیرە یا دەستەی ئاینی.

**sect** (sekt), *n.* = **section.**

**sectarian** (sek-târ′i-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە تیرە یا تاقمی ئاینی.
(٢) سەر بە تاقم یا تیرەی ئاینی؛ تیرەگەر؛ تاقم خواز.
(٣) مێشك تەسك؛ بیرتەسك؛ کوێرباوەڕ (ئاین).
***n.*** (١) کەسێکی لە کڵێسە یا ئاین هەڵگەڕاوە.

(۲) ئەندامی تیرە یا تاقمێکی ئاینی.
(۳) کەسێکی بیرتەسک یا کوێرباوەڕ (ئاین).

**sectarianism** (sek-târ′i-ən-iz′m), ***n.*** (۱) تیرەگەری (ئاین)؛ سەر بە تیرەی ئاینی بوون. (۲) بیروباوەڕی تیرەگەری ئاینی.

**sectarianize** (sek-târ′i-ən-īz′), ***v.t.*** تیرەتیرەکردنی ئاینی؛ جیاکردنەوە یا بەش بەش کردنی ئاینی.

**sectary** (sek′tə-ri), ***n.*** (۱) sectarian. (۲) [S-]، کەسێکی لە کڵێسە هەڵگەڕاوە یا جیابووەوە (بەتایبەتی پرۆتستانتێک).

**sectile** (sek′til), ***adj.*** بە ئاسانی بە چەقۆ دەبڕێ یا قاش دەکرێ.
-sectility ***(n.).***

**section** (sek′shən), ***n.*** (۱) قاش کردن؛ بەش کردن؛ بڕین؛ پارچە پارچە کردن. (۲) بەش؛ پارچە؛ کەرت. (۳) قاش؛ کووز. (٤) تویّ (بۆ لێکۆڵینەوە بە گەردبین)؛ برگە؛ پارچەی زۆر تەنک. (٥) بەند (نووسراو)؛ پارچە (نووسراو). (٦) خانە؛ بەش؛ شەقڵ. (۷) پۆل (زیندەوەرزانی). (۸) بەشێکی زەوییە بریتییە لە (٦٤٠) بانەگا یا ئەیکەر. (۹) لق (سوپا، هێزی دەریایی)؛ پەل. (۱۰) ناوچە. (۱۱) (ا) فارگۆنی نووستنی دوو نهۆمیی شەمەندەفەر. (ب) شەمەندەفەری هەمان خشتە لەگەڵ شەمەندەفەرێکی تردا.

***v.t.*** (۱) قاش کردن؛ بەش کردن؛ بەش بەش کردن؛ بڕین؛ پارچە پارچە کردن؛ کەرتکردن. (۲) شانە جیاکردنەوە (توێکاری).

**sectional** (sek′shən-′l), ***adj.*** (۱) ناوچەیی. (۲) خانە خانە؛ خانە خانەیی؛ پارچە پارچە. (۳) برگەیی؛ قاشی؛ پارچەیی.

***n.*** کەرەسەیەکی ناوماڵی خانە خانەیە کە دەتوانرێ هەمووی پێکەوە یا بە جیا بەکاربهێنرێ.

**sectionalism** (sek′shən-′l-iz′m), ***n.*** ناوچەگەرێتی؛ ناوچەپەرستی.

**sectionalize** (sek′shən-′l-īz′), ***v.t.*** (۱) خانە خانە کردن؛ پۆل پۆل کردن؛ بەش بەش کردن. (۲) بەش کردن بە ناوچە ناوچەوە؛ ناوچە ناوچە کردن.

**sector** (sek′tēr), ***n.*** (۱) کەرتە بازنە. (۲) ئامێری گۆشەپێوان و کێشە لێکدانەوە (ئەندازە). (۳) ناوچەی سوپایی؛ کەرتی سوپایی. (٤) گەڕەک؛ ناوچەی شار؛ گوزەر؛ ناوچە.

***v.t.*** بەش کردن بە ناوچە ناوچەوە؛ بەش بەش کردن؛ کەرت کەرت کردن.
-sectorial ***(adj.).***

**secular** (sek′yoo-lēr), ***adj.*** (۱) جیهانی؛ نائاینی؛ تایبەتی بەم جیهانە: ***( ~ music ; ~ schools)*** . (۲) نەبەستراو بە پەرستگاوە؛ لە دەرەوەی پەرستگا ژیاو: ***( ~ clergy)*** . (۳) سەدەیی؛ هەر سەد ساڵ جارێك ڕوودەدات. (٤) زۆرخایەن؛ لە چەرخێکەوە بۆ چەرخێك ماوەتەوە. (٥) گوێ بە ئاین نەدەر.

***n.*** (۱) قەشە یا ووشکەسۆفی لە دەرەوەی پەرستگادا ژیاو. (۲) [Obs.]، کەسێکە کە نە قەشە بێت و نە پەیوەندیشی هەبێ بە ئاینەوە.

**secularism** (sek′yoo-lēr-iz′m), ***n.*** (۱) جیهان پەرستی؛ گوێ بە ئاین نەدان و پەیڕەوی نەکردنی؛ لە ئاین دابڕان. (۲) جیاکردنەوەی ئاین لە کاروباری میری و جیهانی بەتایبەتی پەروەردە و فێرکردنی قوتابیان.
-secularist ***(n.)*** ; secularistic ***( adj.).***

**secularity** (sek′yoo-lar′ə-ti), ***n.*** (۱) جیهان پەرستێتی؛ لە ئاین دابڕان؛ گوێ بە ئاین نەدان و پەیڕەوی نەکردنی. (۲) کاروبارێك یا شتێکی جیهانی.

**secularize** (sek′yoo-lə-rīz′), ***v.t.*** (۱) لەژێر دەسەڵاتی ئاین و کڵێسەدا دەرهێنان و کردن بە هی گەل؛ خاوەنێتی لە کڵێسە سەندنەوە. (۲) لە ئاین دابڕین؛ لە ئاین جیاکردنەوە؛ لە ئاین کردن. (۳) بە بیروباوەڕی جیهان پەرستی گۆش کردن؛ گۆڕین بۆ جیهان پەرستی (کاروباری میری و گەل).
-secularization ***(n.).***

**secund** (sē′kənd, sek′ənd), ***adj.*** هەر بە یەك لاوەیە (وەك هەندێك گوڵ).

**secundine** (sek′əndīn′, sek′ən-din), ***n.*** (۱) دیواری دووەم یا ناوەوەی تۆوە چکۆلە (ڕووەکناسی). (۲) ***(pl.)***، after birth # 1 .

**secure** (si-kyoor′), ***adj.*** (۱) دڵنیا. (۲) بێ مەترسی؛ سەلامەت؛ مەترسی لێ ناکرێ. (۳) پارێزراو. (٤) قایم؛ توند؛ چەسپیو؛ قایم کراو: ***( Make the knot ~ .)*** . (٥) بێ گومان؛ مسۆگەر. (٦) [Archaic]، بێباك؛ زۆر پشت ئەستوور.

***v.t.*** (۱) پاراستن؛ پارێزگاری کردن؛ پاس کردن. (۲) داخستن؛ قایم کردن؛ توندکردن؛ باش قایم کردن: ***( He ~d the doors and windows.)*** (۳) دەستەبەری کردن؛ بەڵێندان (بە دانەوەی قەرز): ***( to ~ a loan)*** . (٤) دەسکەوتن؛ پەیداکردن؛ مسۆگەرکردن: ***( We've ~d a cottage for the summer.)***

***v.i.*** دڵنیابوون؛ مەترسی نەبوون.
-securable ***( adj.)*** ; securely ***( adv.).***

**security** (si-kyoor′ə-ti), ***n.*** (۱) ئاسایش؛ سەلامەتی. (۲) دڵنیایی؛ ئاسوودەیی. (۳) بێباکی؛ زۆر پشت ئەستووری. (٤) پاراستن؛ پارێزگاری؛ پاسداری. (٥) (ا) دەستەبەری (قەرزدانەوە). (ب) دەستەبەر. (٦) بارمتە. (۷) ***(pl.)***، قەواڵەی دارایی.

**Security Council,** ئەنجوومەنی ئاسایش (لە کۆمەڵی نەتەوە-یەکگرتووەکان).

**security deposit,** بارمتەی دڵنیایی: خاوەن ماڵ لە کرێچی دەسەنێت بۆ چاکردنەوەی شتی شکاو و بژاردنی هەر زیانێك کرێچییەکە لە خانووەکەی بدات.

**sedan** (si-dan′), ***n.*** (۱) قەمەرە. (۲) sedan chair

**sedate** (si-dāt′), ***adj.*** لەسەرخۆ؛ هێمن؛ سەنگین.

**sedate** (si-dāt′), ***v.t.*** دەرمانی هێمنکەرەوە پێدان؛ هێمنکردنەوە؛ دەرمانی ئازارکوژ پێدان؛ دامرکاندنەوە.

**sedation** (si-dā′shən), ***n.*** (۱) هێمنکردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ ئازارکوشتن؛ ئازار مراندن. (۲) ئازار بڕان؛ هێمنی؛ بێ ئازاری؛ ئارام؛ دامرکان

**sedative** (sed′ə-tiv), ***adj.*** ئازارکوژ؛ هێمنکەرەوە؛ ئازارمرێن.

***n.*** دەرمانی هێمنکەرەوە؛ دەرمانی ئازارکوژ یا ئازارمرێن.

**sedentary** (sed′′n-ter′i), ***adj.*** (۱) پێویستی زۆر بە دانیشتن هەیە (کار): ***( a ~ job)*** . (۲) هەمیشە دانیشتوو؛ نەجووڵ؛ وەرزش نەکەر. (۳) نیشتەجێ؛ نیشتەنی: ***( ~birds)*** . (٤) نەبزۆك؛ جێگیر؛ نەجووڵ؛ چەسپیو (وەك هەندێك گیانداری قاقلەداری خۆ بە بەردەوە نووسێنەر).
-sedentarily ***(adv.)*** ; sedentariness ***(n.).***

**sedge** (sej), ***n.*** زەل؛ زەلە وورده؛ قەرەم.

**sedilia** (si-dil′i-ə), ***n.*** سێ کورسییە لە خوار قوربانیگای کڵێسەوە بۆ دانیشتنی قەشەکان.

**sediment** (sed′ə-mənt), ***n.*** (۱) تڵپە؛ خڵتە؛ نیشتوو؛ تڵپ. (۲) قوڕولیتە (کە ئاو و با ڕای دەماڵێ).

**sedimentary** (sed′ə-men′tēr-i), ***adj.*** (۱) تڵپەیی؛ قوڕولیتەیی؛

خڵتەیی (٢) نیشتوویی؛ لە نیشتنی قوڕولیتەو بەردی ڕاماڵراوەوە پێکهاتووە.
**sedimentation** (sed´ə-men-tā′shən), *n.* نیشتن (قوڕولیتە. تلپە)؛ ڕامالین و نیشتنی قوڕولیتەو بەرد.. هتد
**sedition** (si-dish′ən), *n.* (١) هاندان بۆ یاخی بوون و شۆڕش کردن (بەقسەو نووسین)؛ فیتدان (٢) [Rare]، یاخی بوون؛ ڕاپەڕین؛ شۆڕش.
**seditionary** (si-dish′ən-er´i), *adj.* = seditious.
*n.* هاندەری یاخییەتی
**seditious** (si-dish′əs), *adj.* (١) (ا) حەز بە هاندانی یاخییەتی
(ب) تاوانی هاندانی یاخییەتی خراوەپاڵ (ج) یاخی؛ ملنەدەر؛ سەرکێش.
(٢) تایبەتی بە هاندانی یاخییەتی؛ هاندان: *( ~ writings)*.
-seditiously *(adv.)* ; seditiousness *(n.)*.
**seduce** (si-do͞os′, si-dūs′), *v.t.* (١) هەڵفریواندن؛ تەفرەدان؛ لەخشتەبردن؛ فریودان (٢) تاوکردن؛ سازکردن (بۆ جووت بوون).
-seducer *(n.)* ; seduceable ; seducible *(adj.)*.
**seducement** (si-do͞os′mənt), *n.* = seduction.
**seduction** (si-duk′shən), *n.* (١) (ا) لەخشتەبردن؛ تەفرەدان؛ هەڵفریوان ب) تاوکردن؛ سازکردن (بۆ جووت بوون). (ج) تاوکران.
(٢) (ا) شتی پێ لەخشتەبردن یا هەڵفریوان.
(ب) شتی پێ تاوکردن؛ هۆی تاوکران؛ تاوکەر (شت).
**seductive** (si-duk′tiv), *adj.* تاوکەر؛ جوان؛ دڵڕفێن؛ هەڵفریوێن؛ لەخشتەبەر (بەهۆی ڕواڵەتی جوانەوە)؛ فریودەر:
*( a ~ woman, offer, idea, life, style, etc.)*
-seductively *(adv.)* ; seductiveness *(n.)*.
**seductress** (si-duk′tris′), *n.* ئافرەتی پیاو تاوکەر.
**sedulity** (si-dū′lə-ti, si-do͞o′lə-ti), *n.* کۆشش؛ کۆڵنەدان؛ هەوڵ و تەقەلا
**sedulous** (sej′oo-ləs), *adj.* کۆششکەر؛ هەوڵدەر؛ کۆڵنەدەر؛ تەقەلاکەر
**sedum** (sē′dəm), *n.* چەند جۆرە ڕووەکێکی هەمەساڵەن گەڵاو لاسک گۆشتن و گوڵی سپی و زەردو سوور دەگرن
**see** (sē), *v.t.* (١) بینین؛ چاوپێکەوتن؛ سەیرکردن؛ بەدی کردن.
(٢) تێگەیشتن؛ هێنانە بەرچاوی خۆ: *( I can't ~ your point.)*.
(٣) بەمێشکدا چوون؛ پەسەندکردن: *( I can't ~ him as president.)*.
(٤) بۆ دەرکەوتن؛ زانین: *( ~ what they want.)*
(٥) چەشتن؛ بەسەرداهاتن؛ بینین *( She had seen better days.; They have seen the results of two wars.)*
(٦) تێڕوانین؛ لێ ووردبوونەوە؛ سەیرکردن.
*( The doctor had better ~ this lump.)*
(٧) دڵنیابوون بە کردنی کارێك بە باشی:
*( ~ that he does the job properly.)*
(٨) ڕەوانەکردن؛ لەگەڵ چوون؛ لەتەکدا چوون
*( I'll ~ you to the door.; He will ~ her to her house.)*
(٩) تووش هاتن؛ بینین؛ چاوپێکەوتن:
*( Have you seen your brother recently?)*
(١٠) چوونە لا؛ سەرلێدان (بۆ ڕاوێژکردن):
*( You had better ~ a lawyer.)*
(١١) پێشوازی لێکردن؛ ڕێ دان بۆ دیدەنی: *( He is too ill to ~ you.)*.
(١٢) بینین؛ چوون *( Have you seen the new movie?)*.
*v.i.* (١) چاو بینین؛ توانای بینین هەبوون.
(٢) چاوبرکردن؛ بەدی کردن؛ بینین: *( I can't ~ that far.)*.
(٣) تێگەیشتن. (٤) بۆ گەڕان؛ چاو ووردکردنەوە؛ گەڕان.
(٥) بیرکردنەوە *( Let me ~ , where did I put it?)*.
*interj.* سەیرکە!؛ تەماشاکە!
see about, (١) لێکۆڵینەوە؛ تێڕوانین.
(٢) ئاگاداری کردن؛ ئاگا لێ بوون؛ چاودێری کردن.
see into, (١) لێکۆڵینەوە؛ تێڕوانین.
(٢) باش تێگەیشتن؛ بە تەواوی بۆ دەرکەوتن یا بینین (ڕاست و درۆی شتێك یا کەسێك).
see off, بەڕێ کردن؛ ڕەوانەکردن؛ خواحافیزی لێکردن (لە فڕۆکەخانە یا ئێستگەی شەمەندەفەر...هتد): *( We saw him off at the airport.)*
see through, (١) باش تێگەیشتن؛ بە تەواوی بۆ دەرکەوتن یا بینینی درۆو ڕاستی کەسێك یا شتێك: *( I can see through his lies now.)*
(٢) بەردەوام بوون لەسەرو دەست لێ هەڵنەگرتن هەتا تەواوکردن:
*( to see a project through)*
(٣) یارمەتیدان و دەست لێ بەر نەدان هەتا دوایی:
*( to see someone through a difficulty)*
see to, چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن.
**see** (sē), *n.* (١) سەرەك قەشەنشین؛ ناوچەی لێپرسراوی سەرەك قەشە؛ مەڵبەندی سەرەك قەشە. (٢) پلەوپایەو دەسەڵاتی سەرەك قەشە؛ سەرەك قەشەیەتی (٣) [Obs.]، تەخت.
the Holy See, (١) ڕۆما (کە پاپا سەرەك قەشەیەتی).
(پێشی دەووترێ: " See of Rome ").
(٢) پاپایەتی؛ دەسەڵاتی پاپا؛ دامودەزگای پاپا.
**seed** (sēd), *n.* (١) تۆو؛ ناوك؛ دەنك. (٢) تۆو بەگشتی.
(٣) سەرچاوە؛ تۆو (مەجاز):
*( Oppression sows the ~s of revolt.)*
(٤) بنەچە.
(٥) نەوە؛ وەچە؛ وەجاخ.
(٦) تۆماو؛ تۆوی نێر؛ تۆم؛ تۆو.
(٧) seed oyster.
*v.t.* (١) تۆودان؛ تۆو چاندن؛ تۆوکردن؛ تۆو وەشاندن.
(٢) ناووك لێ دەرهێنان.
(٣) تۆودانی هەور بە ماددەی کیمیایی بۆ باران بارین: *( to ~ the clouds)*.
(٤) هەڵبژاردن و پلە بۆ دانانی وەرزشکار.
*v.i.* (١) پێگەیشتن و تۆوکردن.
(٢) تۆوکردن؛ تۆو فڕێدان؛ پیربوون (ڕووەك).
(٣) تۆو چاندن؛ تۆودان
go to seed, (١) تۆوکردن؛ تۆو فڕێدان.
(٢) پیرەمڵۆك بوون؛ ووشك بوون؛ فەوتان؛ بەکارنەمان.
**seedbed** (sēd′bed´), *n.* شەتڵگا.
**seed-case** (sēd′kās´), *n.* کەلوو؛ بەرگە تۆو؛ قاوغە تۆو.
**seed coat,** توێکی تۆو؛ پێستی تۆو.
**seeder** (sēd′ēr), *n.* (١) ئامێری تۆودەر یا تۆووەشێن.
(٢) ئامێری ناوك دەرهێنەر (لە مێووژ...هتد).
**seedling** (sēd′liŋ), *n.* (١) نەمام (کە لە تۆوەوە بێت)؛ شەتڵ.
(٢) درەختێکی بچکۆلە؛ نەمام.
**seedman** (sēd′mən), *n.* = seedsman.
**seed oysters,** بەچکە گوێچکەماسی.
**seed pearl,** مرواری زۆر بچکۆلە.
**seed plant,** ڕووەکی تۆودار.
**seeds-man** (sēdz′mən), *n.* (١) تۆودەر؛ تۆووەشێن.
(٢) تۆوفرۆش.
**seed-time** (sēd′tīm´), *n.* وەرزی تۆو چاندن
**seed vessel,** کەلوو؛ قاوغەتۆو؛ بەرگە تۆو.
(پێشی دەووترێ: " seed capsule " وە " pericarp ").
**seedy** (sēd′i), *adj.* (١) ناوکی زۆرە؛ پڕە لەتۆو:
*( This orange is too ~ .)*
(٢) لە تۆو دەچێت.
(٣) پیرەمڵۆك؛ فەوتاو؛ تۆوکردوو؛ ووشك.
(٤) (ا) پنتی؛ شڕپۆش؛ جل دڕاو.

*n.* ماددەی بۆگەنکەر یا پیسکەر.
**septicemia, septicaemia** (sep´tə-sē′mi-ə), *n* بۆگەن بوونی
خوێن؛ ژەهراوی بوونی خوێن. (هەروەها پێشی دەووترێ: " saremia " و
" blood poisoning " ووشەی " sepsis " ببینە).
**septicidal** (sep´tə-sī′d'l), *adj.* قلیشاوەتەوە بە درێژایی پەردە یا
دیوارەکەی (میوە، تۆو، کەلوو)؛ شەق بردوو: *( a ~ fruit)* .
**septicity** (sep-tis′ə-ti), *n.* (١) بۆگەنی؛ پیسی.
(٢) (ا) بۆگەن بوون؛ پیس بوون.
(ب) بۆگەنکەری؛ پیسکەری.
**septic sore throat,** = **strep throat.**
**septic tank,** تانکی پیسایی؛ تانکی ئاودەست (پیسایی توالێت و شتی
تری تێدا کۆدەبێتەوە و دەڕژێنرێ).
**septilateral** (sep´tə-lat′ēr-əl), *adj.* حەوتلا
**septillion** (sep-til′yən), *n.* سێپتیلیۆن: (ا) ژمارەیەکە بریتی‌یە لە
یەک و بیست و چوار سفر (لە ئەمەریکا و فەرەنسا).
(ب) ژمارەیەکە بریتی‌یە لە یەک و چل و دوو سفر (لە ئینگلتەرە و ئەڵمانیا).
**septimal** (sep′ti-məl), *adj.* حەوتی؛ تایبەتی بە ژمارە حەوت.
**septuagenarian** (sep´choo͞-ə-ji-nâr′ri-ən), *adj.* کەسێکی
حەفتا ساڵە؛ کەسێکە تەمەنی لەنێوان حەفتا و هەشتا ساڵدا بێت.
*adj.* (١) حەفتا ساڵە؛ تەمەن نێوان حەفتا و هەشتا ساڵی؛ حەفتایی.
(٢) تایبەتی بە خەڵکی تەمەن حەفتا ساڵ.
**septum** (sep′təm), *n.* پەردەی جیاکەرەوە (گیانەوەرناسی،
ڕووەکناسی)؛ دیواری ناوبەین: *( The nostrils are divided by a ~ .)* .
**septuple** (sep′too͞-p'l, sep-tū′p'l), *adj.* (١) حەوت؛
لە حەوت پێکهاتوو. (٢) حەوت ئەوەندە.
*v.t.* لە حەوت دان؛ حەوت ئەوەندە کردن.
**septuplet** (sep′too͞-p'l-it´, sep-tū′p'l-it´), *n.* (١) حەوت دانە؛
حەوت (٢) یەکێک لە حەوت منداڵی بە یەک سک لەدایکبوو.
(٣) ( *pl* ) حەوتە؛ حەوت منداڵی بە یەک سک لەدایکبوو.
**sepulcher, sepulchre** (sep′'l-kēr), *n.* (١) گۆڕ؛ قەبر
(٢) جێی شتی پیرۆز هەڵگرتن (بەتایبەتی لە قوربانیگای کڵێسەدا).
*v.t.* ناشتن؛ گۆڕکردن.
**the Holy sepulcher,** گۆڕی عیسا.
**sepulchral,** (١) تایبەتی بە گۆڕ؛ تایبەتی بە ناشتن.
(٢) لە گۆڕ دەچێت؛ تاریک و نووتەک؛ ناخۆش
(٣) غەمگین (دەنگ، ئاوان)؛ دڵگیر.
**sepulchre** (sep′'l-kēr), *n.* [British spelling], = **sepulcher.**
**sepulture** (sep′'l-chēr), *n.* (١) ناشتن؛ گۆڕکردن
(٢) [Archaic]، **sepulcher** .
**sequacious** (si-kwā′shəs), *adj.* (١) شوێن کەوتوو؛ گوێ ڕایەڵ؛
حەز بە شوێن کەوتن یا پاشکۆیەتی کەر؛ ملکەچ؛ لاساییکەرەوە؛ کلکی.
(٢) بە ڕێز و ڕێک و پێکی کراو.
-**sequaciously** *( adv.)* ; **sequacity** *(n.).*
**sequel** (sē′kwəl), *n.* (١) پاشکۆ؛ پاشینە؛ پاشبەند.
(٢) پاشکۆی بەرهەمێکی وێژەیی یا چیرۆکی. (٣) ئەنجام.
**sequela** (si-kwē′lə), *n.* نەخۆشی پاشکۆ: نەخۆشی‌یەکە کە لە
نەخۆشی‌یەکی ترەوە داکەوتبێتەوە.
**sequence** (sē′kwəns), *n.* (١) بەرودوایی؛ ڕستە؛ یەک لەدوای یەک.
(٢) ڕیز؛ سەرە.
(٣) زنجیرە (بەتایبەتی هی شتی نەپچڕاوی چوونیەک): *( a sonnet ~ )* .
(٤) سێ کاغەزی یەک لەدوای یەکی پێڕێک (قومار، یاری).
(٥) ئەنجام (٦) زنجیرە وێنەی نەپچڕاوی فیلمێکی سینەما.
(٧) سروودی ئاینی (کڵێسە).
**in sequence,** بەرودوا؛ بە ڕیز؛ بەرووودوای یەکتری.
**sequent** (sē′kwənt), *adj.* (١) داهاتوو؛ ئاینده؛ هی دوایی؛ لە دوا.
(٢) ئەنجامی.
*n.* ئەنجام.
**sequential** (si-kwen′shəl), *adj.* (١) **sequent** .
(٢) زنجیرەیی؛ بەرودوایی.
**sequester** (si-kwes′tēr), *v.t.* (١) جیاکردنەوە (لە خەڵک)؛
دوورخستنەوە: *( The judge ~ed the jury.)* .
(٢) دەستبەسەرداگرتنی شتوومەک (هەتا قەرزدانەوە).
(٣) دەستبەسەرداگرتن (لەلایەن میری‌یەوە).
(٤) کشانەوە بۆ کونجێک:
( He ~s himself in his study every afternoon.)
**sequestered** (si-kwes′tērd), *adj.* جیاکراوە؛ جیا؛ گۆشەگیر؛
پەناگر؛ دوور؛ چەپە.
**sequestrate** (si-kwes′trāt), *v.t.* (١) دەستبەسەرداگرتن (لەلایەن
میری‌یەوە). (٢) [Archaic]، **sequester** .
-**sequestrator** *(n.).*
**sequestration** (si-kwes′trā′shən), *n.* (١) جیاکردنەوە؛ دابڕین؛
دوورخستنەوە. (٢) (ا) دەستبەسەرداگرتن (هەتا قەرزدانەوە).
(ب) دەستبەسەرداگرتن (لەلایەن میری‌یەوە).
**sequestrectomy** (sē´kwes-trek′tə-mi), *n.* لێکردنەوەی
تەڵەزمە ئێسقانی مردوو لە ئێسقانی زیندوو (نەشتەرگەری).
**sequestrum** (si-kwes′trəm), *n.* تەڵەزمە ئێسقانی مردووی
جیابووەوە لە ئێسقانی زیندوو.
**sequin** (sē′kwin), *n.* (١) پارەیەکی ئاڵتوونی ئیتاڵی کۆنە.
(٢) پوولەکە (کە جل و بەرگی ژنانی پێ دەڕازێنرێتەوە).
**sequined, sequinned,** بە پوولەکە ڕازاوە؛ پوولەکاوی.
**sequoia** (si-kwoi′ə), *n.* سکۆیا: جۆرە درەختێکی زۆر زل کالیفۆرنیایە
لە توخمی کاج.
**serac** (sā′rak′), *n.* بارستایی‌یەکی زل سەهۆڵە بەسەر ڕووباری سەهۆڵەوە.
**seraglio** (si-ral′yō, se-räl′yō), *n.* کۆشکی سوڵتان یا پاشای
تورکی؛ سەرا.
**serai** (sə-rä′i), *n.* سەرا؛ کۆشکی سوڵتان یا پاشای تورکی.
**serape, sarape** (se-rä′pi), *n.* = **poncho 1.**
**seraph** (ser′əf), *n.* سێراف: فریشتەیەکە لە بەرزترین چینی فریشتە
(ئاین).
-**seraphic** ; **seraphical** *( adj.)* ; **seraphically** *( adv.).*
**seraphim** (ser′ə-fim´), *n.* *alternative plural of* **seraph.**
**Serb** (sūrb), *n. & adj.* = **Serbian.**
**Serbian** (sūr′bi-ən), *adj.* سربی (گەل، کلتوور، زمان)؛
تایبەتی بە سربیا.
*n.* (١) سربی؛ هاونیشتمانی‌یەکی سربیا (لە یوگۆسلاڤیا).
(٢) زمانی سربی؛ سربی.
**sere** (sēr), *n.* ئەو گۆڕینانەیە کە بەسەر ڕووەکێکدا دێت لە سەرەتاوە تا
دوایی.
**sere** (sēr), *adj.* [Poetic], سیس؛ هەڵقرچاو؛ هەڵپرووکاو؛ ووشکەوەبوو.
(ووشەی " **sear** " ببینە).
**serenade** (ser´ə-nād′), *n.* ئاوازێکی مۆسیقایە دڵدارێک بە شەو بۆ
دڵدارەکەی لێ دەدات لەبەر پەنجەرەیەکدا.
*v.t. & v.i.* ئاوازی مۆسیقالێدان بۆ دڵدار بە شەو لەبەر پەنجەرەیەکدا؛
گۆرانی بۆ ووتن؛ لاواندنەوە.
**serenata** (ser´ə-nä′tə), *n.* (١) پارچەیەک مۆسیقا و گۆرانی‌یە
دەربارەی ژیانی لادێ. (٢) پارچەیەک مۆسیقای ئۆرکسترایە.
**serendipity** (ser´ən-dip′ə-ti), *n.* بەهرەی شتی خۆش و باش
دۆزینەوە بە ڕێکەوت.
**serene** (sə-rēn′), *adj.* (١) سایەقە؛ ڕوون: *( a ~ sky)* .
(٢) ئاسوودە؛ هێمن؛ کپ؛ کش و مات؛ خامۆش؛ بێ دەنگ؛ پڕ ئاسوودە:

( a ~ look, smile, temper. life, etc.)

(۲) [S-]. خاوەن شکۆ؛ بەڕێز؛ نازناوی ئەندامانی هەندێ خێزانی شازادەی ئەوروپاییە . *( His ~ Highness)* .

***n.*** [Rare or Poetic], ئاسمانی ڕوون؛ سایەقەی سامان؛ دەریای ڕوون.

**-srenely** *( adv.)* ; **sereneness** *(n.)*.

**srenity** (sə-rən′ə-ti), ***n.*** (۱) ئاسوودەیی؛ هێمنی؛ خامۆشی؛ پڕ ئاسوودەیی؛ کپی؛ کش‌وماتی؛ بێ دەنگی.

(۲) ڕوونی (ئاسمان، ئاو)؛ ڕۆشنی.

(۳) [S-]. بەڕێزی. نازناوی ئەندامانی هەندێ خێزانی شازادەی ئەوروپاییە.

**serf** (sũrf), ***n.*** (۱) بەندە؛ کۆیلە؛ بەند.

(۲) مسکین. (۳) کەسێکی چەوساوە.

**serfage** (sũr′fij), ***n.*** = sefrdom.

**serfdom** (sũrf′dəm), ***n.*** (۱) بەندەگی؛ بەندایەتی؛ کۆیلەیی؛ بەندەگەری؛ ڕژێمی بەندایەتی. (۲) مسکێنی.

**serfhood** (sũrf′hood′), ***n.*** بەندگەل؛ بەندان.

**serge** (sũrj), ***n.*** سەرج: کالایەکی خوری قایمە (دەستە جلی لێ درووست دەکرێت)

**sergeant** (sär′jənt), ***n.*** (۱) بەردەستی دەرەبەگ لەکاتی جەنگدا.

(۲) **sergeant-at-arms** . (۳) چاوەشی پۆلیس. (٤) چاوەش (سوپا).

**sergent-at-arms** (sär′jənt-ət-ärmz′), ***n.*** ئەفسەری ئاسایش (لە دادگا یا ژووری پەرلەماندا)؛ لێپرسراوی ئاسایش (لە هەمان شوێندا).

**sergeant fish,** جۆرە ماسییەکی میلدارە.

**sergeant major,** باش چاوەش.

**serial** (sêr′i-əl), ***adj.*** (۱) زنجیرەبەست؛ بە ڕیز؛ یەك لەدوای یەك؛ ڕیز. *( ~ numbers)* .

(۲) زنجیرەیی (چیرۆك، پەرتووك)؛ بە زنجیرە بلاوکراوە.

(۳) تایبەتی بە بلاوکراوەی زنجیرەیی.

***n.*** (۱) (ا) چیرۆك یا پەرتووکی زنجیرەیی (لە گۆڤاردا یا لەسەر تەلەفزیۆن).

(ب) ئەلقەیەکی ئەم زنجیرەیە. (۲) گۆڤار.

**serialize** (sêr′i-ə-līz′), ***v.t.*** بلاوکردنەوە لە شێوەی زنجیرەدا.

**serially** (sêr′i-əl-i), ***adv.*** بە ڕیز؛ یەك لەدوای یەك.

**serial number,** ژمارەی زنجیرەیی؛ ژمارە لە زنجیرەدا؛ ژمارە:

( ~s are given to soldiers and engines to indentify them.)

**seriate** (sêr′i-it), ***adj.*** زنجیرەبەستوو؛ ڕیز ڕیز؛ ڕیزکراو؛ بە ڕیز ڕێکخراو.

**seriatim** (sêr′i-ā′tim, ser′i-ā′tim), ***adv.*** = serially.

**sericeous** (si-rish′əs), ***adj.*** (۱) ئاوریشمی.

(۲) تووکن (گەڵا و میوە و بەر)؛ تووکی نەرمدار؛ تووکاوی.

**sericin** (ser′i-sin′), ***n.*** ماددەیەکی لینجی جەلاتینییە لە ئاوریشم دەردەهێنرێت

**sericulture** (ser′i-kul′chẽr), ***n.*** کرمی ئاوریشم پەروەردەکردن بۆ بەرهەمهێنانی ئاوریشم.

**seriema** (ser′i-ē′mə, ser′i-ā′mə), ***n.*** (۱) باڵندەیەکی بەرازیلییە لە توخمی قولنگ. (۲) باڵندەیەکی ئەرجەنتینی وەك ئەم باڵندەیەو بچووکتر.

**series** (sêr′iz), ***n.pl.*** (۱) زنجیرە، ڕیز؛ ڕستە؛ چەند:

( a ~ of accidents, victories. defeats, etc.)

(۲) زنجیرە شتی پەیوەندیدار؛ ڕستە.

(۳) زنجیرە :ژمارە و پێوان؛ زنجیرەبەست.

(٤) زنجیرە ووشە یا ووتەی هاوتای ڕستەیەك (ڕێزمان).

**serif** (ser′if), ***n.*** کلکە تیپ. هێڵێکی باریکە وەك کلك دەکرێ بۆ سەر یا ژێری هەندێ تیپی وەك M یا S (چاپەمەنی).

**serin** (ser′in, sêr′in), ***n.*** باڵندەیەکی زەردی ئەوروپاییە لە توخمی فیسقە

**serine** (ser′ēn, sêr′in), ***n.*** ترشێکی ئەمینییە لەگەڵێك پرۆتیندا هەیە (کیمیا)

**serious** (sêr′i-əs), ***adj.*** (۱) توندگیر؛ سەنگین؛ توندوتیژ؛ سوور لەسەر مەبەست؛ مەنگ: *( a ~ man)* .

(۲) مۆن؛ مرومۆن؛ گرژ؛ مروموچ: *( a ~ face)* .

(۳) (ا) ڕاستی نەك گاڵتە؛ بەدڵ؛ بێ گاڵتە.

(ب) کاریگەر؛ کۆششکەر؛ بە دڵ هەوڵدەر: *( a ~ worker)* .

(٤) گرنگ؛ سەخت: *( a ~ matter)* .

(٥) ترسناك؛ پڕ مەترسی؛ سامناك؛ ستەم؛ مەترسیدار؛ پەرێشان:

( a ~ illness, situation, etc.)

**seriously** (sêr′i-əs-li), ***adv.*** (۱) بەدڵ؛ بە ڕاستی؛ بە گەرمی؛ بەبێ گاڵتە؛ بە توندی؛ بە دڵ و بە گیان.

(۲) بە شێوەیەك کە مەترسی لێ بکرێ: *( He is ~ ill.)* .

**seriousness** (sêr′i-əs-nis), ***n.*** (۱) بە توندی گرتن؛ سووربوون لەسەر مەبەست. (۲) بە ڕاست بوون نەك بە گاڵتە. (۳) مەترسی؛ ترسناکی؛ سامناکی.

**in all seriousness,** بەبێ گاڵتە؛ بە ڕاستییەوە؛ بەدڵ؛ بە توندی.

**serjeant** (sär′jənt), ***n.*** [British spelling], = sergeant.

**sermon** (sũr′mən), ***n.*** (۱) پەندو ئامۆژگاری ئاینی (کە لە مزگەوت و کڵێسەدا مەلا یا قەشە دەیخوێنێتەوە)؛ ووتاری ئاینی.

(۲) پەندو ئامۆژگاری دەربارەی ڕەفتارو ئەرکی سەرشان (بەتایبەتی هی ووشك و ناخۆش).

**-sermonic; ermonical** *(adj.)*.

**sermonize** (sũr′mə-nīz′), ***v.t. & v.i.*** (۱) پەندی ئاینی خوێندنەوە (لە مزگەوت یا کڵێسەدا). (۲) ئامۆژگاری کردن (بەتایبەتی بە جۆرێك کە بۆنی سەرزەنشتی لێ بێت)؛ تەمێ کردن.

**-sermonizer** *(n.)*.

**Sermon on the Mount,** پەندی سەر شاخەکە: پەندو ئامۆژگارییەکەی عیسایە بۆ خەڵکەکەی (کە ناوکرۆکی ئاینی خاچ پەرستییە).

**sero-** (sêr′ō, sêr′ə), پێشگرێکە بەمانای: زەرداوی خوێن:

( serology)

**serology** (si-rol′ə-ji), ***n.*** زانستی زەرداوی خوێن.

**-serologic ; serological** *( adj.)* ; **serologist** *(n.)*.

**serosa,** = **serous membrane.**

**serosity** (si-ros′ə-ti), ***n.*** (۱) شلەی ناو جومگەکانی لەش.

(۲) لە زەرداوی خوێن چوون.

**serotine** (ser′ə-tin, ser′ə-tīn′), ***adj.*** درەنگ گوڵ کردوو؛ درەنگ پێگەیشتوو (ڕووەك).

**serotinous** (si-rot′ə-nəs), ***adj.*** = serotine.

**serous** (sêr′əs), ***adj.*** (۱) لە زەرداوی خوێن دەچێت؛ ئاوی تێدایە.

(۲) شل؛ ئاوی.

**serous membrane,** پەردەی تەنکی شلە دەردەری بۆشایی ناولەش.

**serow** (ser′ō), ***n.*** جۆرێکە لە بزنە کێوی.

**serpent** (sũr′pənt), ***n.*** (۱) مار؛ ماری؛ ژەهراوی؛ ئەژدیها.

(۲) کەسێکی ناپاك و نهێنگرو ئۆینباز.

(۳) فیشەکە شێتەیەکی مار ئاسایی، واتە پێچ پێچۆکە.

(٤) شەیتان (ئینجیل). (٥) ئامێرێکی دارینی فووپیاکردنی مۆسیقای کۆنە.

**serpentine** (sũr′pən-tēn′, sũr′pən-tīn′), ***adj.*** (۱) مارین؛ ماری؛ لەمار دەچێت. (۲) ناپاك؛ ئۆینباز؛ فێڵباز؛ پیس.

(۳) پێچ پێچۆکە؛ لوول.

***n.*** بەردەمار: بەردێکی سەوزی پنکەپنکەیە وەك کاژی مار.

**serpiginous** (sẽr-pij′ə-nəs), ***adj.*** بلاوبووەوە (وەك هەمێدێك نەخۆشی پێست)؛ خشۆك؛ تەشەنەکەر. (ووشەی دوایی ببینە).

**serpigo** (sẽr-pī′gō), ***n.*** نەخۆشییەکی پێستی تەشەنەکەرە.

**serranid** (ser′ə-nid′), ***n.*** جۆرە ماسییەکە قەراغی پوولەکەکانی تیژو گرنج گرنجن.

***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە ماسییە.

**serranoid** (ser′ə-noid´), *adj. & n.* = serranid.
**serrate** (ser′āt, ser′it), *adj. Also* serrated, گرنج گرنج؛
دانەدار؛ دان داناوی؛ مشاری: *( ~ leaves ; a ~d knife)* .
**serration** (se-rā′shən), *n.* (١) گرنج گرنجی؛ دانەداری؛ دان دانی؛
مشارێتی. (٢) ددان (وەك هی مشارو چەقۆی دەم مشاری)؛ گرنج؛ نووك.
(٣) ڕیزە ددان (مشار، دەمی چەقۆی مشاری).
**serried** (ser′id), *adj.* چڕ (ڕیزە سەرباز یا درەخت)؛ تێکچڕاو؛
تێکترنجاو
**serriform** (ser′ə-fôrm´), *adj.* = serrate.
**serrulate** (ser′oo-lāt´), *adj. Also* serrulated, ددانی ووردی
هەیە (وەك هەندێك مشار)؛ گرنجەکانی ووردن.
**serrulation** (ser´yoo-lā′shən), *n.* (١) ددانی ووردداری (وەك
هەندێك مشار)؛ گرنج ووردی؛ ددان ووردی.
(٢) یەکێك لەم ددان یا گرنجە ووردانە.
(٣) ڕیزە ددان یا گرنجی وورد.
**serry** (ser′i), *v.t.* تێخزان؛ تێکچڕان؛ تێ ترنجان.
**serum** (sêr′əm), *n.* (١) زەرداوی خوێن: بریتییە لە شلاوی خوێن کە
خڕۆکە سوورو سپییەکانی تێدا نییە. (٢) whey .
(٣) شلاوی سەوزەوات.
**serval** (sũr′vəl), *n.* پشیلە پڵنگ: پشیلە کێوییەکی لاق درێژی بەڵەکە،
واتە پنکەپنکەیە
**servant** (sũr′vənt), *n.* (١) بەردەست؛ خزمەتکار؛ خزمەتچی.
(٢) بەندە؛ کۆیلە. (٣) civil servant .
(٤) نۆکەر: *( your obedient ~ )* .
**serve** (sũrv), *v.t.* (١) بەردەستی کردن؛ خزمەت کردن؛ نۆکەری کردن.
(٢) (ا) ئامادەکردن و پێشکەش کردن *( He ~d tea to his guests.)* .
(ب) بەردەستی کردن لە چێشتخانەدا؛ خواردن بۆ هێنان.
(ج) نان تێکردن؛ خواردن تێکردن: *( She will ~ dinner at seven.)* .
(٣) خزمەت کردن (کڕیار لە فرۆشگادا)؛ یارمەتیدان؛ داوا جێبەجێکردن:
( to ~ the customer, the public, etc.)
(٤) (ا) برەوپێدان؛ خزمەت کردن:
( He ~d his country as a great statesman.)
(ب) پەرستن؛ خزمەت کردن: *( He ~s God, not man.)* .
(٥) سەربازی کردن؛ شەڕ بۆ وولات کردن
(٦) کات بردنەسەر (بەندیخانە، سوپا): *( He ~d two years in jail.)* .
(٧) کار هەڵسووڕاندن؛ پێ هەڵسان؛ ئەرك بینین؛ خزمەت کردن؛ کردن:
( He ~d three terms in Congress.)
(٨) شیان؛ بەس بوون؛ باش بوون؛ گونجان:
( One nail will ~ my purpose.)
(٩) بەکارهێنران: *( One hospital ~s the entire city.)* .
(١٠) لێ پەڕین: *( The buck ~d the doe.)*
(١١) ئیش بۆ کردن؛ بۆ باش بوون:
( His cunning ~d him well. ; My memory ~s me well.)
(١٢) تۆڵەلێکردنەوە: *( Punish her : it will ~ her right.)* .
(١٣) بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەفتار لەگەڵ کردن.
(١٤) پێ ڕاگەیاندن (فەرمانی دادگا بەتایبەتی داوالێکردن بۆ هاتنە دادگا).
(١٥) سێرف لێدان (یاری تەنس و باڵە).
(١٦) بە تەل دەورگرتنی پەت یا گوریس بۆ قایمی.
(١٧) تفەنگ تەقاندن یا چاك کردنەوە.
*v.i.* (١) بەردەستی کردن؛ بوون بە بەردەست یا خزمەتکار؛ بوون بە نۆکەر.
(٢) لە سوپادا بوون؛ سەربازی کردن: *( He ~d in the army.)* .
(٣) کار هەڵسووڕاندن؛ ئەرك بینین:
( to ~ on a committee ; She ~s in Congress now.)
(٤) بەکارهێنران؛ بەکارهاتن.
(٥) شیان؛ بەس بوون؛ بەکارهاتن: *( This nail is too short to ~ )* .

(٦) بەردەستی کردن لە چێشتخانەدا.
(٧) گونجان؛ باش بوون بۆ.
(٨) سێرف لێدان (یاری تەنس و باڵە).
(٩) یارمەتیدانی قەشە لە بەرنوێژیدا.
*n.* سێرف (یاری تەنس و باڵە)؛ نۆبەو ماف و شێوەی سێرف لێدان.
**serve one right,** شایستەی ئەو سزایەیە کە دراوە؛
سزاکەی پڕ بە پێی خۆیەتی؛ هەقی خۆیەتی.
**server** (sũr′vẽr), *n.* (١) یاریدەدەری قەشە لە بەرنوێژیدا.
(٢) سێرف لێدەر (یاری تەنس و باڵە).
(٣) (ا) بەردەستی چێشتخانە. (ب) بەردەست؛ خزمەتکار.
(٤) سینی (بۆ چاو خواردەمەنی).
**service** (sũr′vis), *n.* (١) خزمەت؛ خزمەتگوزاری؛ خزمەتکاری؛
خزمەتچێتی.
(٢) مووچەخۆری میری؛ فەرمانبەری؛ فەرمانبەرێتی: *( public ~ )* .
(٣) (ا) سوپا؛ هێزی چەکدارو سەربازو ئەفسەرەکان.
(ب) هێزە چەکدارەکانی ئەمەریکا:
*( He was in the ~ for three years.)*
(٤) کار هەڵسووڕان؛ کارگوزاری؛ خزمەت؛ خزمەتگوزاری:
*( professional ~s ; repair ~ )*
(٥) [Rare or Archaic]، ڕێزو دڵسۆزی (بۆ دڵدارێك)؛ دەربەست.
(٦) خواپەرستی (لەڕێی نوێژو پڕنژو ئیشی چاکەوە).
(٧) (ا) نوێژی بە کۆمەڵ.
(ب) نەریتی ئاینی یا کۆمەڵایەتی: *( Church ~ ; marriage ~ )* .
(٨) چاکە؛ پیاوەتی؛ یارمەتی. (٩) سوود؛ کەڵك.
(١٠) شێوە یا چاك و خراپی بەردەستی (چێشتخانە، ئوتێل، چایخانە):
( The food was good but the ~ was poor.)
(١١) تاقمی کەوچك و چەتاڵی سەر مێزی نانخواردن: *( breakfast ~ )*
(١٢) بەرژەوەندی؛ کارگوزاری؛ خزمەتگوزاری:
( telephone ~ ; electric ~ ; postal ~ )
(١٣) شێوەی پێشکەش کردنی ئەم خزمەتگوزارییە.
(١٤) باش و خراپی ئەم خزمەتگوزارییە: *( Our telephone ~ is good.)*
(١٥) ئەو خزمەتەیە کە فرۆشیار پێشکەشی دەکات بە کڕیار (وەك بۆ بژاردن و
چاك کردنەوەی فرۆتەنی خراپ و شکاو...هتد).
(١٦) (ا) سێرف (یاری تەنس و باڵە)؛ نۆرەو شێوەی سێرف لێدان.
(ب) تۆپ لەکاتی سێرف لێداندا.
(١٧) لێ پەڕین؛ لێچوونی گیانداری نێر لە مێ.
(١٨) پێ ڕاگەیاندنی فەرمانی دادگا (بە هاتن بۆ دادگا).
(١٩) تەلی پێچراو بەدەوری پەت و گوریسدا بۆ قایمی (کەشتیوانی).
*adj.* (١) بەکەڵك؛ بەسوود؛ خزمەتی پێ دەکرێت.
(٢) بۆ بەردەست و ئیشکەرانی دەزگایەکە نەك بۆ خەڵك:
( a ~ elevator, entrance, etc.)
(٣) سوپایی؛ هی سوپا؛ تایبەتی بە هێزی چەکداران.
*v.t.* (١) پێشکەش کردنی پێویستییەك بە خەڵك؛ خزمەت کردنی خەڵك:
( One telephone company ~s the entire city.)
(٢) چاك کردنەوە (مەکینەکاری)؛ چاك کردن؛ بەردەوامی پێدان؛
سازکردن (مەکینە)؛ ڕۆن و پلاك...هتد گۆڕین (ئوتومبیل): *( to ~ a car)* .
(٣) لێ پەڕین؛ لێچوون (گیانداری نێر لە مێ).
**at one's service,** (١) ئامادەبوون بۆ بەردەستی کردن و یارمەتی و
هاوکاری: *( I am at your service.)* .
(٢) ئامادەبوون بۆ بەکارهێنان؛ لەبەردەستدابوون.
**of service,** بەکەڵك؛ سوودبەخش:
*[ Is he ( it) of any service to you? ]*
**service** (sũr′vis), *n.* دارێکە بەرێکی بچووکی خڕ یا هەرمێیی دەگرێت و
دەخورێت.
**serviceable** (sũr′vis-ə-b'l), *adj.* (١) بەکەڵك؛ بەسوود؛ باش؛

بەکاردەهێنری. (٢) بەرگەگر؛ قایم: *(a ~ fabric)* .
(٣) [Archaic]، گوێ ڕایەڵ؛ خزمەتگوزار؛ کارگوزار.
**-serviceability** *(n.)* ; **serviceably** *(adv.)*.
**service cap,** تەپلەی سوپایی؛ شەپقەی ئەفسەرو سەرباز.
**service elevator,** ئەسانسێری بەردەستو جانتاو شتومەك (ئوتێلو دەزگای تری وەها).
**service entrance,** دەزگای بەردەستو کرێکارو شتومەك (ئوتێل، چێشتخانە، فرۆشگای گەورە...هتد).
**service charge,** مزی بەردەستی یا خزمەت (چێشتخانە، دەزگای بازرگانی)
**service dress,** بەرگی سەربازو ئەفسەر.
**serviceman** (sũr′vis-man´), *n.* (١) سەرباز؛ ئەفسەر
(٢) مەکینەو ئامێر سازکەر یا چاککەرەوە: *( a telephone ~ )* .
**service station,** (١) gas station .
(٢) کارخانە یا دووکانی ئامێری ئەلەکتریكو مەکینەی شکاوو چاك کردنەوەو پارچە کڕین ...هتد.
**service tree,** دارێکە بەرێکی بچووکی خڕ یا هەرمێیی دەگرێتو دەخورێت.
**serviette** (sũr´vi-et′), *n.* دەسەسڕی خوان؛ دەستماڵی سفرە.
**servile** (sũr′v'l), *adj.* (١) بەندەیی؛ کۆیلەیەتی؛ تایبەتی بە بەندە: ( a ~ class ; a ~ revolt)
(٢) بۆ بەندە شیاو؛ وەك هی کۆیلە؛ بەردەستی *(~ work)* .
(٣) ملکەچ؛ ڕیسوا؛ چاوشۆڕ؛ نۆکەرئاسا: *(~ flattery ; a ~ attitude)* .
(٤) [Archaic]، ژێردەستە؛ ئائازاد.
**-servilely** *(adv.)* ; **servileness** *(n.)*.
**servility** (sẽr-vil′ə-ti), *n.* بەندایەتی؛ کۆیلەیەتی؛ ڕیسوایی؛ سەرشۆڕی؛ ملکەچی؛ چاوشۆڕی.
**serving** (sũr′viŋ), *n.* (١) بەردەستی؛ بەردەستی کردن؛ خزمەت؛ نۆکەری (٢) ئەوەندە خواردن یا خواردنەوەیە کە کەسێك بۆ خۆی تێ دەکات یا بۆی تێ دەکرێت بە جارێك؛ بەشی کەسێك (خواردن یا خواردنەوە): ( The food is enough for four - s )
***adj.*** هی خواردن تێکردن؛ هی خواردن تیاخواردن یا پێشکەش کردن: ( a ~ dish)
**servitor** (sũr′və-tẽr), *n.* بەردەست؛ خزمەتکار؛ خزمەتچی؛ نۆکەر.
**servitude** (sũr′və-to͞od´, sũr′və-tūd´), *n.* (١) بەندەگەری؛ بەندەگی؛ بەندایەتی؛ کۆیلەیی.
(٢) بێگار؛ کاری زۆرەملێ (بۆ سزادان): *( penal ~ )* .
(٣) sasement .
**sesame** (ses′ə-mē´), *n.* کونجی
**sesamoid** (ses′ə-moid´), *adj.* لە کونجی دەچێت (توێکاری)؛ کونجی‌یی.
***n.*** ئێسقانێك یا کرکراگەیەکی وەك کونجی.
**sesqui-** (ses′kwi), پێشگرێکە بەمانای: یەكو نیوێك: ( sesquicentennial)
**sesquicentennial** (ses´kwi-sen-ten′i-əl), *adj.* سەدوپەنجا ساڵی
***n.*** یادی سەدوپەنجا ساڵە.
**sesquipedal** (ses-kwip′i-d'l, ses′kwi-pē′d'l), *adj.* = **sesquipedalian.**
**sesquipedalian** (ses´kwi-pə-dā′li-ən), *adj.* (١) پێ و نیوێك درێژە (٢) زۆر درێژ (ووشە).
(٣) ووشەی زۆر درێژ بەکارهێنەر؛ ووشەی زۆر درێژی تێدایە.
***n.*** ووشەیەکی درێژ.
**sessile** (ses′il), *adj.* (١) (ا) بنەکەی یەکسەر بە شتێکەوە نووساوە بەبێ مل یا کلك (گیانەوەرناسی). (ب) چەسپیو؛ ناجوولێت؛ نەبزۆك (گیانەوەرناسی).
(٢) بنەکەی یەکسەر بە قەفەکەوە نووساوە (گەڵا، گوڵ)؛ بێ لاسك: ( ~ leaves, flowers, etc.)
**session** (sesh′ən), *n.* (١) کۆبوونەوەیەك (ئەنجوومەنی پەرلەمان، دادگا...هتد)؛ دانیشتنێك؛ کۆڕێك: *( the morning ~ of Congress, the court, etc.)*
(٢) چەند کۆبوونەوەیەك یا کۆڕێکی ئەنجوومەنێك؛ زنجیرە کۆڕ.
(٣) سەردەمی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنێك؛ کایە، خول، یا ماوەی دانیشتنی ئەنجوومەنێك.
(٤) وەرزی قوتابخانە؛ ئەو کاتەی قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە (ڕۆژ یا ساڵ): ( the summer ~ )
(٥) تاقمێك کە بۆ مەبەستێکی تایبەتی کۆبووبێتنەوە؛ کۆڕ: *( a gossip ~ )* .
(٦) دادگای تاوان (لە ئەمەریکا): *( the court of ~s)* .
(٧) ماوەی چالاکی‌یەکی تایبەتی؛ کایە؛ نۆرە؛ کۆڕ: *( a recording ~ )*
**-sessional** *( adj.)* ; **sessionally** *( adv.)*.
**in session,** لە کۆڕگرتندایە؛ لە کۆبوونەوەدایە؛ گیراوە (کۆڕ)؛ کراوەتەوە (قوتابخانە):
[ *The court* ( Congress) *is in session.; School is in session from September to June.; School is in session from 8:00 A.M. to 3:00 P.M.* ]
**sesterce** (ses′tũrs), *n.* سێستەرس: پارەیەکی کەم بایەخی ڕۆمانی کۆنە وەك فلس.
**sestertium** (ses-tũr′shi-əm), *n.* سێستەرتیەم: پارەیەکی ڕۆمانی کۆنە هەزار " سێستەرس" ە.
**sestet** (ses-tet′, ses′tet), *n.* (١) sextet #2 .
(٢) شەش دێڕی دوایی " سۆنیت" ە. (" سۆنیت" بریتی‌یە لە هۆنراوەیەکی چواردە دێڕی کە لە ئیتاڵیاوە داهاتووە).
**sestina** (ses-tē′nə), *n.* هۆنراوەی شەشی: هۆنراوەیەکە لە شەش بەش پێکهاتووە هەر بەشەیشی لە شەش دێڕ؛ شەش خشتەکی
**set** (set), *v.t.* (١) دانیشاندن؛ دانان.
(٢) (ا) کڕکەوتن (مریشك)؛ کڕ.
(ب) هێلکە خستنە ژێر مریشکی کڕەوە یا ناو مەکینەی هەڵهێنانەوە
(٣) خستنەسەر؛ لەسەردانان: *( ~ the book on the table.)*
(٤) خستنە جێی خۆی: *( He ~ the wheel on the axle.)* .
(٥) خستنەسەر شوێنێکی تایبەتی (لەش): ( He ~ his hand on my shoulder.)
(٦) پێوەنان؛ لێدان: *( She ~ a match to the paper.)* .
(٧) (ا) نووسین؛ تۆمارکردن؛ خستنەسەر کاغەز: *( ~ it down on paper.)* .
(ب) ئیمزاکردن.
(٨) کردن؛ والێکردن؛ تێ بەردان: *( He ~ the house on fire.)* .
(٩) چاك کردن؛ چاك کردنەوە؛ ڕاستکردنەوە؛ سازاندن؛ ڕێکخستن.
(١٠) نانەوە (تەڵە، داو، کاتژمێری ووریاکردنەوە): ( to ~ a trap, an alarm clock, etc.)
(١١) بایەوان هەڵدان یا کردنەوە: *( to ~ the sails)* .
(١٢) ڕاستکردنەوە؛ لەسەر ژمارەیەکی تایبەتی دانان ( ڕادیۆ، کاتژمێر...هتد)؛ چاك کردن: *( to ~ a watch, an alarm clock, a radio dial, etc.)*
(١٣) ددانی مشار ڕاستکردنەوە.
(١٤) سفرە ڕاخستن؛ ئامادەکردن (مێزی نانخواردن): *( to ~ the table)*
(١٥) ئێسقان گرتنەوە؛ ئێسکبەندکردن؛ گرتنەوە: *( to ~ a bone)* .
(١٦) چەسپاندن (ڕا، بڕیار...هتد).
(١٧) دەق پێ بەستن (محەللەبی)؛ مەیاندن.
(١٨) گەوهەر خستنە ئەموستیلە یا کاتژمێرەوە.
(١٩) تیادانان؛ تێخستن؛ تیا چەسپاندن: ( ~ the glass in the window.)
(٢٠) قژلوولکەر لە قژ دان؛ تەوقەلێدان.
(٢١) پاڵ پێوەنان.

(٢٢) ڕووتێکردن: ( *He ~ his face toward home.*) .

(٢٣) (ا) دانان؛ دیاری کردن: ( *to ~ a goal*) .

(ب) مێشك خستنەسەر؛ دڵ خستنەسەر:

( to ~ one's mind or heart on somebody or something)

(٢٤) (ا) دانان (لە شوێنێك یا لەسەر کارێکی تایبەتی):

( We ~ sentris at all the gates)

(ب) دامەزراندن؛ دانان (لەسەر نیش).

(ج) سنوور بۆ دانان: ( *to ~ limits*) .

(د) کات بۆ دانان یا دیاری کردن: ( *We have ~ a date fot the ship.*) .

(هـ) دوا کات بۆ دانان: ( *to ~ a deadline*) .

(و) دانان (یاسا، پەیرەوی)؛ چەسپاندن: ( *to ~ regulations*) .

(٢٥) (ا) بوون بە نموونە بۆ خەڵك: ( *to ~ an example for others*) .

(ب) ڕێگە بۆ (خەڵك) دانان؛ شێواز دیاری کردن:

( The President ~s the tone.)

(٢٦) (ا) ئەرك بەسەرداداان؛ کار بۆ دانان.

(ب) دەس بە نیش کردن.

(٢٧) (ا) لەسەردانان (نرخ، کرێ)؛ بۆ برینەوە: ( *to ~ the price*) .

(ب) بۆبرینەوە (سزا): ( *The judge ~ the fine at fifty dollars.*) .

(٢٨) خستنەلاوە بۆ هەڵهاتن (هەویر).

(٢٩) دانان (نەخشە، پیلان، ڕێ... هتد).

(٣٠) ڕووکردنە جێی نێچیر (سەگی ڕاو).

(٣١) (ا) ئاواز بۆ دانان: ( *to ~ the words to music*) .

(ب) وشە نووسین یا دانان بۆ ئاواز.

(٣٢) تیپ بۆ دروستکردن (چاپەمەنی).

(٣٣) (ا) دانانی ڕووداوی شانۆنامە لە شوێنێکدا:

( Shakepeare ~ the scene in Venice.)

(ب) ڕێکخستنی دیمەن بە جۆرێکی تایبەتی.

(ج) ئامادەکردن (شانۆ): ( *to ~ the stage*) .

***v.i.*** (١) کرکەوتن (مریشك، باڵندە).

(٢) مەین: خۆگرتن؛ دەق بەستن؛ دەق گرتن:

( The cement ~ after several hours.)

(٣) گرتن (خوم، بۆیە)؛ گرتنەخۆ.

(٤) ( ~ out ; ~ forth ; ~ off ; ~ forward ) ، دەستپێکردن (گەشت)؛ کەوتنەڕێ. (٥) هەڵکردن یا چوون بەرەو

(٦) ئاوابوون: ( *The sun ~s in the west.*)

(٧) کزبوون؛ کەم بوونەوە؛ کەم کردن؛ بەناخداچوون.

(٨) وەستان (جل)؛ پێ کردن (جل‌وبەرگ): ( *The jacket ~s well.*) .

(٩) [Dial] دانیشتن.

(١٠) بەرگرتن: پێکهاتنی بەر لەدوای لەیەکدان (ڕووەکناسی).

(١١) بەرەو جێی نێچیر ڕوانین (سەگی ڕاو).

(١٢) کەوتنە شوێنێکی تایبەتییەوە؛ لە شوێنێکدا بوون:

( The village is ~ among rolling hills and green fields.)

***adj.*** (١) دانراو؛ دیاریکراو: ( *a ~ time*) .

(٢) بڕاوە؛ بڕیاردراو؛ چەسپێنراو (بەپێی پەیرەو یا یاسا).

(٣) دەسەنقەست؛ بەمەبەست

(٤) هیچی تازەی تێدا نییە؛ دانراو و نەگۆڕاو: ( *a ~ speech*) .

(٥) جێگیر؛ چەسپیو؛ نەجوولا؛ نەبزۆك.

(٦) کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ سوور لەسەر.

(٧) توند: مەییو؛ دەق گرتوو.

(٨) ئامادە (بۆ دەستپێکردن بە پێشبڕکێ): ( *get ~* ) .

(٩) پێکهاتوو؛ دروستکراو؛ پێکهێنراو.

***n.*** (١) بەرەو جێی نێچیر سەیرکردنی سەگی ڕاو

(٢) مەین: دەق گرتن؛ بەستن؛ توندبوون. (٣) ڕێ؛ ڕێباز؛ ڕوو.

(٤) مەین: ئارەزوو. (٥) نوشتانەوە؛ خواربوون؛ چەمینەوە.

(٦) شێوەی وەستان یا پێ کردن (جل‌وبەرگ)

(٧) شێوەی وەستانی ئەندامێکی لەش.

(٨) کەرەسەو دیمەن و هەموو ئەو شتانەی شانۆی پێ ئامادە دەکرێ:

( He designed the ~ .)

(٩) شەتڵ؛ قەڵەم.

(١٠) تاقم (بەتایبەتی هی هاوپیشە یا هاوخوو)؛ دەستە؛ کۆمەڵ:

( the jet ~ ; a ~ of smugglers)

(١١) (ا) دەستە (شت)؛ تاقم؛ پۆل: ( *to arrange in ~s*) .

(ب) تاقمە ئامێر: ( *a carpentry ~* ) .

(ج) دەستە پەرتووك یا گۆڤاری نووسەرێك لەسەر هەمان باس.

(د) تاقمە قاپ و کەوچك و چەتاڵ: ( *a ~ of dishes*) .

(هـ) تاقمە ددان.

(١٢) دەزگا (تەلەفزیۆن، ڕادیۆ... هتد)؛ ئامێر: ( *a television ~* ) .

(١٣) دەستە (یاری تەنس).

**all set, [Colloq.],** ئامادە.

**set about,** دەستپێکردن.

**set against,** (١) هاوتاکردن. (٢) بەراوردکردن.

(٣) لێ هاندان؛ کردن بەگژدا؛ تێ بەردان:

( to set one group or person against another)

**set apart,** (١) خستنەلاوە؛ هەڵگرتن (بۆ دواڕۆژ).

(٢) جیاکردنەوە؛ لێك جیاکردنەوە.

(٣) خستنە بەرچاو (بە جیاکردنەوە)؛ دەرخستن.

**set aside,** (١) (ا) خستنەلاوە؛ هەڵگرتن (بۆ دواڕۆژ).

(ب) بۆ تەرخان کردن (پارە، کات)؛ بۆ دانان. (٢) جیاکردنەوە.

(٣) فڕێدان؛ نەویستن. (٤) پووچ کردنەوە.

**set back,** (١) کاتژمێر گەڕاندنە دواوە. (٢) گەڕاندنە دواوە.

**set down,** (١) دانان؛ خستنەسەر:

( Set it down on the table.)

(٢) تۆمارکردن؛ نووسین؛ خستنەسەر کاغەز.

(٣) دابەزاندن. (٤) وادانان.

(٥) دانەپاڵ؛ خستنەپاڵ.

**set forth,** (١) ووتن؛ بێژان. (٢) بڵاوکردنەوە.

**set in,** (١) دەستپێکردن (ڕوودان).

(٢) بەرەو قەراغ دەریا هەڵکردن؛ بەرەو کەنار دەریا چوون (ئاو، با).

**set off,** (١) خستنەسەر نیش؛ خستنەسەر ڕێ؛ دەستپێکردن.

(٢) وەهاڵێکردن کە دیار بێت یا سەرنج ڕاکێشێ؛ باش دەرخستن

(٣) ڕازاندنەوە.

(٤) بەرامبەرکردن؛ بەرامبەر وەستان.

(٥) تەقاندن؛ تەقاندنەوە: ( *to set off a bomb*) .

**set on,** (١) هاندان؛ تێ کردن؛ تێ بەردان:

( She set her dog on them.)

(٢) هێرش بردنە سەر؛ پەلاماردان.

**set out,** (١) سنوور بۆ دانان؛ سنوور بۆ دیاری کردن.

(٢) نەخشەکێشان (شار، باخچە... هتد).

(٣) پیشاندان (بۆ فرۆشتن)؛ خستنەپێش چاو.

(٤) ئاشتن (شەتڵ).

(٥) دەستپێکردن (گەشت)؛ کەوتنەڕێ؛ ملی ڕێ گرتن.

**set to,** (١) دەستپێکردن؛ دەست بە نیش کردن. (٢) دەست بە شەڕ کردن.

**set up,** (١) (ا) ڕاستکردنەوە؛ بە پێوە دانان.

(ب) بەرزکردنەوە؛ بڵندکردنەوە.

(٢) هەڵدان (چادر، دەوار)؛ دروستکردن (خانوو)؛ پێکەوەنان.

(٣) دامەزراندن؛ دروستکردن؛ دانان:

( *to set up a government in exile*)

(٤) دەستپێکردن.

(٥) پارەپێدان (بۆ دانانی بازرگانییەك یا کاسبییەك)؛ دامەزراندن:

( to set someone up in a business)

(٦) نانەوە (نیشان).

(٧) دامەزراندن لە ئیشێکی بەرزدا؛ دەسەڵات پێدان.

(٨) پێشنیازکردن.

(٩) [Colloq.]، خواردنەوە بۆ هێنان یا بۆ کڕین.

(١٠) [Colloq.]، هێنانە جۆش؛ خستنە جۆش.

**set upon,** پەلاماردان؛ هەڵمەت بردنە سەر؛ هێرش بۆ بردن.

**seta** (sē′tə), *n.* تووکی زبر یا تیژ (زیندەوەرزانی)؛ تیسك؛ دڕك؛ پژ.

**setaceous** (si-tā′shəs), *adj.* (١) تیسکن؛ دڕکاوی؛ تووکی زبردار؛ پژدار. (٢) لە تووکی زبر چوو؛ لە دڕك دەچێت.

**setback** (set′bak′), *n.* (١) نوشوستی؛ تێکشکان؛ دانەدواوە.

(٢) (ا) گەڕانە دواوەی دیوار.

(ب) گەڕانە دواوەی لاسەرووی دیواری باڵەخانە (کە دەبێتە هۆی تەسکبوونەوەی باڵەخانەکە).

(٣) دووری خانوو لە شەقامەوە (بەپێی یاسا).

**set chisel,** ئەسکەنەی دەم پان.

**seti-** (sē′ti), پێشگرێکە بەمانای: تیسك؛ تووکی زبر؛ دڕك: ( setiferous)

**setiferous** (si-tif′ēr-əs), *adj.* دڕکاوی؛ تیسکن؛ تووکی زبردار.

**setiform** (sē′tə-fôrm′), *adj.* = setiferous.

**setline** (set-līn′), *n.* زنجیرە قولاپێکی ڕاوەماسییە (بەلەمێك ڕایدەکێشێت بەدوای خۆیدا).

(پێشی دەووترێ: " **trawl** "، " **trawl line** "، " **trotline** ").

**set-off** (set′ôf′), *n.* (١) لەبری؛ لەجیاتی؛ بەرامبەر؛ پارسەنگ.

(٢) شتێك یا دۆخێکە کە لەبەر جیاوازیتی لەگەڵ شتێك یا دۆخێکی تردا زیاتر دەیخاتە بەرچاو. (٣) شتی ڕازێنەرەوە.

(٤) (ا) داوای بەرامبەر (لەلایەن قەرزارێکەوە بۆ خاوەن قەرز).

(ب) بڕینەوەی قەرزارییەك بەم جۆرە.

**setose** (sē′tōs, si-tōs′), *adj.* = setaceous.

**set-screw** (set′skrōō′), *n.* (١) بورغووی ڕاگیرکردن؛ بورغویەکی بێ سەرە دەکرێت بە دووشتدا بۆ نەجوولانیان.

(٢) بروغووی ڕاگیرکردنی کرژی زەمبەلەك یا سپرینگ.

**settee** (se-tē′), *n.* (١) تەختەی دانیشتنی درێژی پاڵپشتدار.

(٢) قەنەفەی بچووك یا مام ناوەندی.

**setter** (set′ēr), *n.* (١) دانەر؛ ڕێکخەر: *( a ~ of rules)*.

(٢) جۆرە سەگێکی ڕاوی تیسکنە.

**setting** (set′iŋ), *n.* (١) دانان؛ چەسپاندن؛ چاك کردن؛ سازاندن؛ ڕێکخستن. (٢) چوارچێوەی گەوهەر تێخراو (وەك لە ئەموستیلەیەکدا).

(٣) دەوروبەر (هی چیرۆك، شانۆنامە، مرۆڤ)؛ جێ؛ شوێن و کات و دەوروپشتی شتێك یا ڕووداوێك. (٤) دیمەن و دەوروبەری شانۆ و فیلم.

(٥) ئاوازی دانراو بۆ فیلم یا هۆنراوە.

(٦) هێلکەی ژێر مریشکە بەکڕ. (٧) ئاوابوون.

**settle** (set′'l), *n.* تەختەی دانیشتنی درێژی پاڵپشت بەرزی قوڵ.

**settle** (set′'l), *v.t.* (١) ڕێك وپێك کردن؛ ڕێکخستن.

(٢) جێگیرکردن؛ چەسپاندن؛ باش دانان.

(٣) جێنشین کردن؛ نیشتەجێ کردن:

( The firm has ~d its employees in nearby houses.)

(٤) ئاوەدانکردنەوە: *( America was ~d by Europeans.)*.

(٥) نیشاندن؛ نیشتن: *( The rain will ~ the dust.)*.

(٦) پالاوتن؛ پوختەکردن.

(٧) هێمنکردنەوە؛ ئارام پێدان؛ هێنانەوە سەرخۆ:

( This medicine will ~ your stomach.)

(٨) [Colloq.]، سەرکوتانەوە؛ بە سەروپۆتەلاکدا کێشان؛ لێدان.

(٩) چەسپاندن؛ پتەوکردن.

(١٠) دامەزراندن (لەسەر ئیش، کاسبی، ژن بۆ هێنان).

(١١) بڕینەوە (ناکۆکی)؛ خستن بە لایەکدا؛ یەکلایی کردنەوە؛ ڕێکخستن:

*( to ~ an argument, a dispute, disagreement, etc.; They've ~d their differences.)*

(١٢) بڕیاردان (ناکۆکییەك لە دەرەوەی دادگا).

(١٣) دانەوە (قەرز)؛ دان.

*v.i.* (١) جێگیربوون؛ وەستان؛ نیشتنەوە؛ گیرسانەوە:

( The bird ~d on the wire.)

(٢) گرتنەوە؛ داپۆشین؛ بەسەرا داباڕین:

( Darkness ~d on the troubled city.)

(٣) جێنشین بوون؛ نیشتەجێبوون؛ گیرسانەوە؛ نیشتنەوە (مەجاز):

( They ~d in California.)

(٤) نیشتن؛ نەوین؛ داکەوتن: *( The bridge ~d at one end.)*.

(٥) نیشتن (خڵتە، تلپە):

( The sediments ~d at the bottom of the cup.)

(٦) ڕوون بوونەوە (بە نیشتنی خڵتە)؛ پوختەبوون.

(٧) هێمن بوونەوە؛ هاتنەوە سەرخۆ؛ دامرکانەوە؛ ئارام گرتن.

(٨) ( **~ with ; ~ on ; ~ upon** )، ڕێکەوتن؛ بڕیاردان؛ بڕینەوە (ناکۆکی).

(٩) قەرزدانەوە.

(١٠) چەسپین؛ جێگیربوون؛ جێی خۆ گرتن؛ دەق گرتن.

**settle down,** (١) جێنشین بوون؛ نیشتەجێ بوون؛ جێگیربوون؛ دامەزراندن و لە ڕاکەڕاك کەوتن (پاش ژنهێنان)؛ دامرکاندنەوە؛ دانیشتن:

( He is now married and settled down.)

(٢) (ا) ئارام گرتن؛ پاڵ لێدانەوە.

(ب) هێمن بوونەوە؛ هاتنەوە سەرخۆ؛ دامرکانەوە.

(٣) بەدڵ دەست بە ئیش کردن یا گوێگرتن: *( to settle down to work)*.

**settle for,** پێ ڕازی بوون؛ پێ قایل بوون.

**settle upon ( or on ),** (١) بڕیار لەسەردان.

(٢) موڵك پێدان یا پێ بەخشین.

**settled** (set′'ld), *adj.* (١) بڕیاری لەسەر دراوە؛ بڕاوەتەوە:

( a ~ matter)

(٢) جێگیر؛ چەسپیو؛ نەگۆڕ.

**settlement** (set′'l-mənt), *n.* (١) جێگیربوون؛ چەسپین.

(٢) دامەزران (لەسەر کار، ژنهێنان، کاسبی...هتد)؛ جێی خۆ گرتن لە ژیاندا.

(٣) ئاوەدانکردنەوە؛ ئاوەدان بوونەوە: *( the ~ of a large area)*.

(٤) ئاوەدانی؛ خەڵکی ئاوەدانییەك.

(٥) دێیەکی چەپە؛ ئاواییەکی تەریك.

(٦) ڕێکەوتن (ناکۆکی)؛ بڕینەوە.

(٧) پاکردنەوە (قەرز)؛ دانەوە (قەرز)؛ ڕێکەوتن لەسەر قەرز یا داوایەك.

(٨) (ا) موڵك بەخشین بە کەسێك. (ب) موڵکی بەخشراو.

(٩) دەزگای کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری گەڕەکی هەژاران.

(١٠) نیشتن (خانوو، پرد)؛ نەوین.

**settler** (set′lēr), *n.* (١) بڕیاردەر؛ شت بڕێنەوە.

(٢) ئاوەدانکەرەوە؛ نیشتەجێی ناوچەیەکی تازە ئاوەدانکراوە؛ نیشتەنی ئاوایی تازە.

**settlings** (set′liŋz), *n.* خڵتە؛ نیشتوو؛ تلپ؛ تلپە.

**set-to** (set′tōō′), *n.* (١) شەڕە مستەکۆڵە؛ شەڕ؛ بەیەکداهاتن.

(٢) مشتومڕی گەرم.

**set-up** (set′up′), *n.* (١) شێوەی ڕێکخستن (کەرەسە، مەکینە، شوێن...هتد)؛ نەخشە؛ ڕێك وپێکی.

(٢) بەژن و باڵا؛ قەڵافەت؛ شێوەی هەڵسان و دانیشتن.

(٣) (*pl.*)، [Colloq.]، کەرەسەی پێکی خواردنەوەی کحول درووستکردن (وەك سەهۆڵ و ئاوی سۆدە...هتد).

(٤) [Slang]، (ا) پێشبڕکێیەکی بە ئاسانی یا بە ساختە بڕاوە (بەپێی ڕێکخستنی پێشەکی)؛ پێشبڕکێیەکە پێشەکی ئەنجامەکەی زانرابێت (لەبەر ساختە تێداکردن و بە دەسەنقەست دۆڕاندنی لایەك)؛ پێشبڕکێی ساختە

(ب) ئەرکێکی بە دەسەنقەست ئاسان کراو؛ کارێکی ئاسان.

**seven** (sev′′n), *n.* حەوت؛ ژمارە حەوت.
**sevenfold** (sev′′n-fōld′), *adj.* (١) حەوتی؛ حەوت بەشی؛
حەوت بەشە؛ حەوت ئەندامی. (٢) حەوت ئەوەندە.
*adv.* حەوت ئەوەندە.
**seven seas,** *Also* Seven Seas, هەموو دەریاکانی جیهان.
**seventeen** (sev′′n-tēn′), *n. & adj.* حەڤدە.
**seventeenth** (sev′′n-tēnth′), *n.* (١) حەڤدەهەم؛ حەڤدەهەمین.
(٢) حەڤدەیەك.
*adj.* (١) حەڤدەهەم؛ حەڤدەهەمین (٢) حەڤدەیەك.
**seventeen-year locust,** کوللەیەکی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکایە
بە کرمۆکەیی لەژێر زەویدا بۆ سیانزە هەتا حەڤدە ساڵ دەژی ئینجا هەراش
دەبێت و بۆ ماوەیەکی زۆر کورت لەسەر زەوی دەژی.
**seventh** (sev′′nth), *n.* (١) حەوتەم؛ حەوتەمین.
(٢) حەوت یەك
(٣) (ا) ئاوازێکی حەوت ئەوەندە بەرزتر یا نزمتر لە ئاوازێکی تر.
(ب) ئاوازێکی حەوت پلەیی.
*adj.* (١) حەوتەم؛ حەوتەمین (٢) حەوت یەك.
**seventh-day** (sev′′nth-dā′), *adj.* (١) هی حەوتەم ڕۆژ، واتە
شەممە. (٢) شەممەوان ئیش ناکات، واتە پشوو دەدات (بەهۆی ئاینەوە).
**seventh heaven,** (١) ئاسمانی حەوتەم.
(٢) ئەوپەڕی شادمانی و ئاسوودەیی: *( I am in the ~ .)*
**seventhly** (sev′′nth-li), *adv.* حەوتەم (لە ژماردنی هۆ یا خاڵدا).
**seventieth** (sev′′n-ti-ith), *adj. & n.* (١) حەفتاهەم؛ حەفتاهەمین.
(٢) حەفتایەك.
**seventy** (sev′′n-ti), *n.* حەفتا
*adj.* حەفتا
**the seventies,** حەفتاکان (لە تەمەنی کەسێکدا یا لەسەدەیەکدا).
**seven-up** (sev′′n-up′), *n.* جۆرە یارییەکی کاغەزە.
**sever** (sev′ẽr), *v.t.* (١) جیاکردنەوە؛ لێك جیاکردنەوە؛ بەش کردن؛
کەرتکردن (٢) بڕینەوە؛ لێکردنەوە؛ پچڕاندن:
*( to ~ a rope with a knife)*
(٣) پچڕاندن (پەیوەندی)؛ بڕین: *( to ~ diplomatic relations)* .
*v.i.* (١) جیابوونەوە؛ دابەشبوون. (٢) بڕینەوە؛ پچڕان.
**-severable** *(adj.).*
**several** (sev′ẽr-əl, sev′rəl), *adj.* (١) جیا؛ جیاواز
( They went their ~ ways.)
(٢) چەند؛ هەندێك: *( ~ of the windows were broken.)* .
*n.* چەند کەسێك یا شتێك
**severally** (sev′ẽr-əl-i, sev′rəl-i), *adv.* (١) بە جیا؛ بە جیا جیا
(٢) یەك لەدوای یەك
**severalty** (sev′ẽr-əl-ti, sev′rəl-ti), *n.* (١) جیاوازی؛ جیایی.
(٢) موڵکی خۆ؛ زەوی‌وزارو خانووی یەك خاوەن.
(٣) خاوەنێتی خۆ؛ خاوەنێتی بێ هاوبەش.
**severance** (sev′ẽr-əns), *n.* (١) بڕینەوە؛ لێك کردنەوە؛ جیاکردنەوە؛
دابڕین (٢) جیابوونەوە؛ بڕانەوە؛ پچڕان (پەیوەندی).
**severance pay,** بەخشیشی لە ئیش خستن: ئەو پارەیەیە کە دەدرێت
بە مووچەخۆرێك لەکاتی دەرکردن یا دوایی پێ هێنانی کارەکەیدا.
**severe** (sə-vêr′), *adj.* (١) مۆن؛ گرژ: *( ~ looks)* .
(٢) توندوتیژ؛ بەزەبر؛ دڵڕەق: *( ~ treatment)* .
(٣) سەخت (ئاووهەوا): *( a ~ winter; ~ weather)* .
(٤) گران؛ قورس؛ سەخت: *( a ~ test of his ability, patience, etc.)* .
(٥) سادە؛ ساکار؛ خاکی؛ ناڕازاوە: *( a ~ style)* .
(٦) ناخۆش؛ تیژ *( ~ pain)* .
**-severeness** *(n.).*
**severely** (sə-vêr′li), *adv.* بە توندوتیژی؛ بە دڵڕەقانە؛ بە توندی.

( You will be ~ punished.)
**severity** (sə-ver′ə-ti), *n.* (١) توندوتیژی؛ بەزەبری. (٢) دڵڕەقی.
(٣) مۆنی؛ گرژی؛ مڕومۆنی.
(٤) سەختی: *( the ~ of a climate)* .
(٥) ترسناکی؛ مەترسی لێکران: *( the ~ of an illness)* .
(٦) سادەیی؛ خاکێتی؛ ساکاری.
(٧) شتێکی توندوتیژ (سزا).
**sew** (sō), *v.t.* دوورین؛ دوورینەوە: *( to ~ a dress)* .
*v.i.* دروومان کردن؛ جل دوورین.
**sew up,** (١) دوورینەوە.
(٢) [Colloq.]، بڕینەوە بە سەرکەوتوویی و باشی (ڕێکەوتن، پەیمان).
(٣) [Colloq.]، قۆرخ کردن (بازاڕ).
**sewage** (soo̅′ij, sū′ij), *n.* پیسایی زێراب؛ پیساوی زێراب؛
زێراباو؛ گەنداو.
**sewer** (soo̅′ẽr, sū′ẽr), *n.* زێراب؛ ئاوەڕۆی ژێر زەمین.
**sewer** (sō′ẽr), *n.* جلدروو.
**sewer** (so͞o′ẽr, sū′ẽr), *n.* سەرەك بەردەستی خوان (لە سەدانی
ناوەڕاستدا).
**sewerage** (so͞o′ẽr-ij, sū′ẽr-ij), *n.* (١) کۆمەڵە زێرابی لێکدراو.
(٢) دەرکردنی گواو و پیساو بە زێرابدا. (٣) **sewage**
**sewing** (sō′iŋ), *n.* (١) جل دوورین؛ جل دروون؛ دروومان.
(٢) بەرگی دووراو؛ کاڵای ئامادە بۆ دروون.
**sewing circle,** تاقمی جل دوورین: تاقمە ژنێکن پێکەوە جل ئەدوورن
(بەتایبەتی بۆ کاری خێرخوایی).
**sewing machine,** مەکینەی جل دوورین.
**sewn** (sōn), *alternative past participle of* **sew.**
**sex** (seks), *n.* (١) زایەندە؛ ڕەگەز (نێر بێت یا مێ)؛ توخم.
(٢) نێرو مێیی؛ ئەو تایبەخۆیانەی کە نێرو مێ لەیەك جیادەکاتەوە
(٣) ڕاکێشانی نێرومێ بۆ یەکتری.
(٤) جووت بوون؛ جووت گرتن: *( He had ~ with her.)* .
**the fair ( or gentle, weaker) sex,** زایەندەی جوان؛
ڕەگەزی جوان؛ ئافرەت؛ ژن.
**the sterner ( or stronger) sex,** زایەندەی بەزەبر یا بەهێز؛ پیاو.
**sex-** (seks), *Also* **sexi-,** پێشگرێکە بەمانای: شەش:
( sexpartite)
**sexagenarian** (sek′sə-ji-nâr′i-ən), *adj.* لە تەمەنی شەست
ساڵیدایە؛ شەست ساڵە.
*n.* کەسێکی شەست ساڵە؛ مرۆڤێکی تەمەن شەست ساڵ و بەرەو ژوور
**sexagenary** (seks-aj′ə-ner′i), *adj.* (١) شەستی؛
تایبەتی بە ژمارە شەست. (٢) بە شەست شەست زیاد دەکات.
(٣) **sexagenarian** .
*n.* کەسێکی شەست ساڵە.
**sexagesimal** (sek′sə-jes′i-m′l), *adj.* شەستی؛
تایبەتی بە ژمارە شەست.
*n.* کەرتی شەستی (بیرکاری).
**sex appeal,** ڕاکێشانی زایەندەی/یا ڕەگەزی؛ دڵفڕێنی؛ جوانی؛
ڕاکێشانی جووت بوون.
**sexcentenary** (seks′sen-ten′ə-ri), *adj.* شەش سەد ساڵی؛
شەش سەدی.
*n.* یادی شەش سەد ساڵی.
**sex chromosome,** کرۆمۆسۆمی ڕەگەز: ئەو کرۆمۆسۆمەیە کە
بڕیاری نێرومێیی زیندەوەر دەدات.
**sexed** (sekst), *adj.* (١) ڕەگەزێکی تایبەتییە؛ نێرە یا مێیە.
(٢) باری زایندەیی لە پلەیەکی تایبەتیدایە (زۆر، کەم، یا مام ناوەندی)؛
ڕاکێشانی ڕەگەزی کەمە یا زۆرە...هتد.

**sexennial** (sek-sen′i-əl), ***adj.*** (١) شەش سالی؛ شەش سالْ خایەن.
(٢) هەر شەش سالْ جارێك ڕوودەدات؛ شەش سالی؛ شەش سالآنە.
**sex hygiene,** تەندرووستی زایندەیی؛ پاك‌وتەمیزی ڕەگەزی یا
جووت بوون (بۆ چاکەی دوو کەسەکە خۆیان‌و کۆمەلیش).
**sexi-** (sek′si), = sex-.
**sexily** (sek′si-li), ***adv.*** بە شێوەیەکی هەوەس هەلسێنانە؛
بە خرۆشانانە
**sexiness** (sek′si-nis), ***n.*** پلەی دلفرێنی؛ ڕادەی خرۆشان یا
هەوەس هەلسێنی.
**sexism** (sek′s-iz'm), ***n.*** (١) دژایەتی ئافرەت؛ لایەن نەگرتنی ژن؛
چەوسانەوەو دژ وەستانی ئافرەت.
(٢) جیاکردنەوەو هەلسەنگانی نابەجێیانەو ئارەزووکاریانەی خەلك
بەگوێرەی نێرو مێیی و هیچی تر.
**sexless** (seks′lis), ***adj.*** (١) بێ ڕەگەز: نە نێرەو نە مێ.
(٢) بێ هەستی جووت بوون؛ سارد؛ بێ ئارەزوو؛ مردوو.
**sexology** (sek-sōl′ə-ji), ***n.*** زانستی زاووزێ؛ زایندەزانی.
**sexpartite** (seks-pär′tīt), ***adj.*** شەش بەشی
**sext** (sekst), ***n.*** (١) چوارەم نوێژی حەوت نوێژی ڕۆژانەی خاچ پەرستان
(کە لە ساتی شەشی ڕۆژدا دەکرێ واتە لە نیوەڕۆدا).
(٢) کاتی ئەم نوێژە، واتە ساتی شەش کە نیوەڕۆ دەگرێتەوە.
**sextain** (seks′tān), ***n.*** شەش خشتەکی؛ بەشێکی شەش دێڕی هۆنراوە.
**sextan** (seks′tən), ***adj.*** شەش ڕۆژی؛ شەش ڕۆژ جارێك ڕوودەدات.
***n.*** شەش بەڕۆ: تایەکە هەر شەش ڕۆژ جارێك سەر لە نەخۆشەکە دەدات.
**sextant** (seks′tənt), ***n.*** (١) ئامێری پێوانی دووری گۆشەیی؛
ئامێری دیاری کردنی کەشتی لە دەریادا لەڕێی پێوانی بەرزی گۆشەیی
ئەستێرەوە (کەشتیەوان بەکاری دەهێنن).
(٢) [Rare]، شەش یەکە بازنە.
**sextet, sextette** (seks-tet′), ***n.*** (١) دەستەی شەشی (مرۆڤ، شت)؛
تاقمی شەشی. (٢) (ا) ئاوازی شەش کەسی یا ئامێری.
(ب) تیپی مۆسیقای شەش کەسی؛ شەش کەسی تیپەکە.
**sextillion** (seks-til′yən), ***n.*** سیکستلیۆن (ا) ژمارەیەکە بریتیەیە
لە یەك‌و بیست‌ویەك سفر (لە ئەمەریکاو فەرەنسا).
(ب) ژمارەیەکە بریتیەیە لە یەك‌و سی‌وشەش سفر (لە ئینگلتەرەوئەلمانیا).
**sexton** (seks′tən), ***n.*** مجەور
**sextuple** (seks′too-p'l, seks-tū′p'l), ***adj.*** (١) شەشی؛
شەش بەشی. (٢) شەش ئەوەندە.
(٣) کێشەی شەش دەنگی (مۆسیقا).
***n.*** شەش ئەوەندە.
***v.t. & v.i.*** شەش ئەوەندە کردن؛ شەش ئەوەندە زۆربوون.
**sextuplet** (seks′too-plit, seks-tū′plit), ***n.*** (١) (ا) مندالێکی
شەش هاوزا؛ یەکێك لە شەش مندالی بە یەك سك لەدایکبوو.
(ب) (*pl.*)، شەشە؛ شەش مندالی بە یەك سك لەدایکبوو.
(٢) دەستەی شەشی (بەتایبەتی هی هاوجۆر).
**sexual** (sek′shōō-əl), ***adj.*** (١) ڕەگەزی؛ زایەندی.
(٢) ئەندامی جووت بوونی هەیە؛ یا نێرە یا مێ
(٣) جووت بوونی؛ هی هەوەس یا هەستی جووت گرتن؛ گاناوی.
(٤) زاووزێیی؛ تایبەتی بە سك‌وزا.
**sexual intercourse,** گان؛ جووت بوون.
(لە کۆندا پێشی دووترا: " **sexual commerce** ").
**sexuality** (sek´shōō-al′ə-ti), ***n.*** (١) زایەندیەتی؛ ڕەگەزێتی؛
جیاکرانەوە بەپێی نێرو مێیی.
(٢) بەئالۆشی؛ جۆش‌وخرۆشی؛ خولیای جووت بوون.
(٣) بار یا پلەی ئارەزووی جووت بوون.
**sexually** (sek′shōō-əl-i), ***adv.*** (١) لەڕووی زایەندە یا ڕەگەزەوە
(٢) لەڕووی جووت بوونەوە.
(٣) بە جووت بوون؛ بە گان؛ بە گاین.
(٤) لەڕووی زاووزێوە؛ بە سك‌و زا.
**sexual organs,** ئەندامی جووت بوون؛ ئەندامی زاووزێ؛ کێرو قوز.
**sexual relations,** جووت بوون؛ گان.
**sexual selection,** هەلبژاردنی زایەندەیی؛ هەلبژاردنی چاکترین
هاوسەر بۆ زاووزێ.
**sexy** (sek′si), ***adj.*** [Slang], هەوەس هەلسێن؛ هەستی جووت بوون
وورووژێنەر؛ بە جۆش‌وخرۆش؛ هێنەرە ئالۆش:
( a -- woman, dress, look, etc.)
**sh** (sh), ***interj.*** بێ دەنگ بە!، ووسکوت بە!؛ ووس!.
**shabby** (shab′i), ***adj.*** (١) پەڕپووت؛ لە کەلاوە دەچێت؛ پیس‌وپۆخل؛
گەند: ***( a ~ house, ~ surrounding)*** .
(٢) دڕاو؛ شڕ؛ شڕووڕ: ***( ~ clothes)*** .
(٣) ڕنتی؛ شڕپۆش؛ شڕە لەبەر.
(٤) هیچ‌وپووچ؛ بێ فەڕ؛ کەم.
(٥) (ا) بەد؛ پیس (ڕەفتار)؛ ناپەسەند: ***( a ~ trick)*** .
(ب) ناڕەوا؛ ناشرین (ڕەفتار):
( a ~ treatment of one's parents, friends, employees, etc.)
**-shabby** ***( adv.)*** ; **shabbiness** ***(n.).***
**shabuoth** (shä-vōō′ōth), ***n. Also*** **shavuot,** جەژنی خەرمان
هەلگرتن (لای جوولەکە).
**shack** (shak), ***n.*** کۆختە؛ زنج؛ قۆختە.
**shack up, [Slang],** (١) شەوبردنە سەر.
(٢) ( **with** ~ )، لەگەلدا ژیان؛ بوون بە هاوماڵ یا هاوسەر:
( She shacked up with him.)
**shackle** (shak′'l), ***n.*** (١) پێوەند؛ کۆت. (٢) کۆسپ؛ بەربەست؛ تەوق.
(٣) ئامێری بەیەکگەیێنەر.
***v.t.*** (١) پێوەندکردن؛ زنجیر کردنە پێ؛ کۆت کردنە قاچ.
(٢) پێکەوەبەستن؛ لێکدان. (٣) بەستنەوە؛ ڕێ لێگرتن؛ بەربەستکردن
**shadblow** (shad′blō´), ***n.*** = **shadbush.**
**shadbush** (shad′boosh´), ***n.*** گۆیژکە: درەختێکی بەرداری بچووکە
گولێکی سپی‌و بەرێکی ئەرخەوانی ڕەشکار دەگرێت.
**shaddock** (shad′ək), ***n.*** (١) مزرە میوەیەکە لە توخمی کەبات‌و لیمۆ.
(٢) درەختی ئەم میوەیە.
**shade** (shād), ***n.*** (١) سێبەر؛ سەهەند؛ فێنکایی.
(٢) تاریکی؛ تاریکایی. (٣) (*pl.*)، شوێنێکی چەپە یا تەریك.
(٤) تاریکایی (وێنە، تابلۆ، نیگار).
(٥) پلەی جیاوازی ڕەنگێك (بەگوێرەی ڕوونی‌و تاریکی): ***( ~s of blue)***
(٦) (ا) جیاوازییەکی کەم؛ نەختێك جیاوازی: ***( ~s of opinion)***
(ب) نەخت؛ تۆز؛ تۆسکاڵ: ***( a ~ of humor in his voice)*** .
(٧) [Poetic]، تارمایی؛ خێو؛ شەبەنگ.
(٨) (ا) کلاوەی لەمپا یا چرا: ***( a lamp ~ )*** .
(ب) پەردە: ***( a window ~ )*** .
***v.t.*** (١) بەری خۆر لێگرتن؛ سێبەر بۆکردن؛ پاراستن (لە گەرمی یا ڕووناکی):
( ~ your eyes from the sun.)
(٢) داپۆشین؛ شاردنەوە. (٣) تاریك کردن؛ لێل کردن.
(٤) تاریك کردن (وێنە، تابلۆ، نیگار)؛ ڕەنگ تاریك کردن.
(٥) نەختێك گۆڕین؛ بە ئاستەم گۆڕین.
(٦) نەختێك کەمکردنەوە (نرخ).
***v.i.*** نەختێك گۆڕان؛ تۆسکالێ گۆڕان (ڕەنگ، ڕادە).
**shading** (shād′iŋ), ***n.*** (١) بەری خۆر یا ڕووناکی گرتن؛
پاراستن لە خۆر یا ڕووناکی؛ سێبەر (بۆ) کردن.
(٢) تاریکی‌و ڕووناکی پیشاندان لە وێنەو تابلۆ دروستکردندا
(٣) جیاوازییەکی کەم؛ نەختێك جیاوازی (چۆنێتی، جۆر...هتد).
**shadow** (shad′ō), ***n.*** (١) سێبەر؛ سێبەری کەسێك یا شتێك.

(٣) تارمایی ٣) (*pl.*)، تاریك و لێڵی دوای ڕۆژاوا؛ تاریكی.
(٤) (أ) پەستی؛ دڵتەنگی؛ خەم؛ بەرچاو تاریكی (ب) شتی دڵتەنگكەر.
(٥) تاریكایی وێنە یا نیگارێك.
(٦) وێنەی ناوێنە؛ وێنە.
(٧) (أ) شتی نەدیو یا نەبینراو؛ شەبەنگ (ب) خێو
(٨) نیشانە؛ نوقلانە؛ نیشانەی ڕوودانی دواڕۆژ
( Coming events cast their ~s before.)
(٩) نەخت؛ تۆسكاڵ: *( without a ~ of doubt)* .
(١٠) پاشماوە؛ هەر بەناو ماو.
(١١) هاودەم؛ هاوبەنگ؛ هاوڕێی هەمیشە لەگەڵ وەك سێبەر؛ ناوەڵ.
(١٢) سیخوڕ؛ پۆلیسی نهێنی(كە هەمیشە بەدوای یەكێكەوە بێت وەك سێبەر).
(١٣) پەناگا؛ پەنا؛ پارێزگا
*v.t.* (١) (أ) بەری ڕووناكی یا گەرمی لێگرتن؛ لە گەرمی یا ڕووناكی پاراستن.
(ب) پاراستن ٢) سێبەر بەسەردا كێشان؛ سێبەر بەسەردا كردن.
(٣) تاریك كردن؛ ناخۆش كردن؛ واڵێكردن كە بەرچاو تاریك بكات.
(٤) ( forth ~)، پێشبینی كردن؛ نوقلانەلێدان
(٥) تاریك كردنی وێنەو تابلۆو نیگار.
(٦) بەدزییەوە شوێن كەوتن: *( The detective ~ed the suspect.)* .
*adj.* هەر بەناو؛ وێنەیی:
( a ~ government in exile ; a ~ cabinet)

**shadow-boxing** (shad′ō-bok′siŋ), *n.* بۆكسبازی خەیاڵی؛
بۆكسبازی لەگەڵ بەرامبەرێكی نەدیودا بۆ مەشق كردن.

**shadow-graph** (shad′ō-graf′), *n.* (١) shadow play .
(٢) وێنەی تیشكی ئێكس.

**shadowless** (shad′ō-lis), *adj.* (١) بێ سێبەر
(٢) بێ تاریكایی یا سێبەر (وەك ڕوویەكی ڕووناك).

**shadow play,** شانۆنامەی تارمایی؛ شانۆگەرییەكە بریتییە لە
پیشاندانی تارمایی نووێنەرو بووكە سەماكەرەكان لەسەر پەردە.

**shadowy** (shad′ō-i), *adj.* (١) سێبەری؛ لە سێبەر دەچێت؛ سەهەندی.
(٢) تاریك؛ پڕ لە سێبەر.
(٣) (أ) لێڵ؛ نەدیار؛ كز.
(ب) نەناسراو؛ نەناس: *( a ~ person, organization, etc.)* .
(٤) نەدیو؛ نەبینراو.

-shadowiness *(n.)*.

**shady** (shād′i), *adj.* (١) سێبەردار؛ بە سێبەر.
(٢) سێبەر؛ سێبەری لەسەرە. *( the ~ side of the street)* .
(٣) لێڵ؛ بەنهانی؛ تاریك.
(٤) [Colloq.]، ناپاك، گوماناوی؛ گومان لێكراو؛ چەوت:
( a ~ deal, transaction, person, etc.)

**keep shady,** [Slang]. خۆشاردنەوە؛ خۆ دەرنەخستن.

**on the shady side of,** گەورەتر لە (تەمەن)؛ پیرتر لە:
( He is on the shady side of forty.)

**shaft** (shaft), *n.* (١) قەدی ڕمو تیر (٢) ڕم؛ نیزە؛ تیر.
(٣) (أ) مووشەك (ب) برووسكە؛ تریشقە. (ج) توانج (د) تیشك
(٤) (أ) [Rare] (أ)، قەدی درەخت؛ لاسك؛ قەفی ڕووەك. (ب) قەفی پەڕ.
(ج) لوولاقە؛ قامیشە (ئێسقان). (د) قەدی مۆمدان.
(هـ) پایە؛ ستوون؛ ئەو بەشەی پایەیە كە لەنێوان سەرەكەی و بنەكەیایە؛
پایەی سەرقووچكە. (و) دارئالآ.
(ز) دەسك (تەور، خاكەناز، بێل): *( the ~ of an axe )* .
(٥) (أ) خانووی باریكی بەرز.
(ب) یەكێك لەو دوو میلەیە كە لەم دیوو ئەو دیوی ئەسپی گالیسكەوەیە بۆ
بەستنەوەی بە گالیسكەكەوە
(ج) ستوونی مەكینە (بۆ بزواندنی)؛ شەفت:
( the drive ~ of an engine)
(٦) (أ) شیش؛ تەوەر؛ تەوەرە.
(ب) لوولە. (ج) ستوون.
(٧) ڕێڕەوی ئەسانسێر: *( an elevator ~ )* .
(٨) باكێش (بۆ هەواگۆڕین لە تونێل، كانی، یا ژێرزەمیندا): *( a mine ~ )*
(٩) لوولەی باكێش (بۆ هەواگۆڕین یا گەرم كردنی خانوو).
*v.t.* (١) " shaft " بۆكردن یا پێوەبەستن.
(٢) [Slang]، بە ناڕەوایانە ڕەفتار لەگەڵ كردن؛ خەڵەتاندن؛ دەستبڕین؛
ناپیاوی لەگەڵ كردن؛ بە دڵڕەقانە لەگەڵ جووڵانەوە: *( He was ~ed.)* .

**shafting** (shaf′tiŋ), *n.* (١) چەند ستوونێكی مەكینە (كە پێكەوە نیش
دەكەن بۆ ووزە گواستنەوە). (٢) كەرەسەی دروستكردنی ئەم ستوونانە.

**shag** (shäg), *n.* (١) قژ یا خوری چنگ لەیەكداو پەستراوە؛
قژی درێژو بژ. (٢) تیسك؛ كوڵك؛ ڕیشەڵ.
(٣) كاڵای تیسكن و زبر؛ قاڵی كوڵكن؛ قوماشی تووكن.
(٤) شتێكی ئاڵۆسكاو و تێكەڵ و پێكەڵ.
(٥) توتنی شیتاڵ شیتاڵ كراو؛ توتنی باش وورد نەكراو واتە درشت.
*v.t.* (١) كوڵكن كردن؛ تیسكن كردن؛ بژكردن.
(٢) [Slang]، ڕاكردن بەدوای تۆپداو گرتنەوەی (یاری بێسبۆڵ)

**shag** (shag), *n.* = **cormorant.**

**shag** (shag), *n.* جۆرە سەمایەكە.
*v.i.* سەماكردن بەم جۆرە.

**shagbark** (shag′bärk′), *n.* (١) درەختێكی ئەمەریكای باكوورە
توێكڵەكەی تەلاشدارو ڕیشاڵدارە بەرەكەی دەخورێت. (٢) داری ئەم درەختە
(٣) بەری ئەم درەختە.

**shaggy** (shag′i), *adj.* (١) تیسكن (فەرش، سەگ)؛ كوڵكن؛ تووكن؛
تووكن و زبر. (٢) بژو درێژو دانەهێنراو؛ چنگی داوەتە یەك؛ ئاڵۆسكاو؛ شێواو:
( ~ hair)
(٣) پنتی؛ شڵ و شێواو؛ شڵ و شۆڵ؛ شڕپۆش؛ قژ بژو دانەهێنراو.

-shaggily *( adv.)* ; shagginess *(n.)*.

**shagreen** (shə-grēn′), *n.* (١) قایشێكی گرنج گرنج و زبرە لە پێستەی
خۆش نەكراوی ئەسپ و حوشترو مانگای دەریا دەكرێت.
(٢) پێستە زبرەكەی كۆسەو سەگەماسی (كە بۆ شت ساف و لووس كردن و
قایش بەكاردەهێنرێت).

**shah** (shä), *n.* شا؛ پاشا؛ پاشای ئێران.

**shake** (shāk), *v.t.* (١) ڕاوەشاندن؛ لەراندنەوە؛ لەقاندن؛ شەكاندنەوە؛
ڕاتەكاندن. (٢) هەڵتەكاندن؛ تەكاندن؛ لێكردنەوە: *( to ~ the dust out)*
(٣) هێنانە لەرزین: *( The tremor shook the building.)* .
(٤) لارەولارپێكردن؛ لەنجەپێكردن؛ لەترپێدان.
(٥) پەشۆكان؛ تێكدان (هەست)؛ ووره پێ بەردان؛ دەمار جووڵاندن؛
پەستكردن؛ شێواندن: *( He was visibly shaken by the news.)* .
(٦) ڕاوەشاندن: *( to ~ one's fist)* .
(٧) شڵەقاندن. (٨) تەوقە لەگەڵ كردن.
(٩) ( off ~)، خۆ لێ ڕزگاركردن؛ لە كۆڵ خۆ كردنەوە: *( to ~ off a cold)*
(١٠) ڕاوەشاندن (زاری تاوڵەو دۆمینە ).
(١١) دەنگ لەراندنەوە (مۆسیقاو گۆرانی).
(١٢) بادان (سەما)؛ باپێدان.
*v.i.* (١) لەرینەوە؛ ڕاوەشان؛ لەقین؛ شەكانەوە؛ شەكینەوە.
(٢) لەرزین؛ هەڵ لەرزین؛ هاتنە لەرزین: *( He was ~ing with fear.)* .
(٣) لەتردان؛ لارەولاركردن؛ لەنجەكردن.
(٤) تەوقەكردن. (٥) دەنگ لەرینەوە (مۆسیقاو گۆرانی).
*n.* (١) لەرە؛ لەرەلەر؛ لەرینەوە؛ ڕاوەشان؛ بادان؛ باپێدان.
(٢) لەرزین؛ لەرزە؛ لەرزەلەرز. (٣) قڵیش (بەرد، دار).
(٤) [Colloq.]، earthquake .
(٥) [Slang]، هەناسە (كات)؛ كاتێكی زۆر كەم: *( I'll be there in a ~ .)* .
(٦) لەرزە (مۆسیقاو گۆرانی )؛ لەرە.
(٧) خواردنەوەیەكی تێكەڵاو و شڵەقێنراو: *( a milk ~ )* .

-shakable; shakeable *(adj.)*.

**give ( a person or thing ) the shake,** [Slang], خۆ لێ ڕزگارکردن (لە کەسێك یا شتێکی ناپەسەند)؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە.
**get a fair ( or good ) shake,** [Slang], بە ویژدانەوە ڕەفتار لەگەڵدا کران: مافی خۆ پێدران؛ بە یەك چاو وەك خەڵکی تر سەیرکران.
**no great shakes,** [Slang], ئاسایی: لێ نەهاتوو: ڕەشۆکی؛ لەوانی تر باشتر نییە.
**shake down,** (١) تەکاندن (درەخت بۆ خستنی بەرەکەی).
(٢) باش پشکنین؛ باش لێ وردبوونەوە یا گەڕان.
(٣) (أ) جێنشین بوون بە سەردەمی. (ب) لەسەر جێگەیەکی سەردەمی نوستن.
(٤) (أ) ڕاهاتن بەدەوروبەری تازە. (ب) جێگیربوون.
(٥) هێنانەخوارەوە؛ کەمکردنەوە.
(٦) [Slang]، پارە لێ کێشانەوە (بە هەڕەشە یا بە فێڵ‌وتەڵەکە)؛ ڕووتکردنەوە.
**shake hands,** تەوقەکردن
**shake off,** خۆ لێ ڕزگارکردن (کەسێك یا شتێکی ناپەسەند)؛ لەکۆڵ خۆ کردنەوە:
( I can't seem to be able to shake off this cold.)
**shake out,** (١) لێ دەرهێنان بە ڕاوەشاندن (وەك خوێ لە خوێداندا).
(٢) تەکاندن (پێڵاو، بەڕە). (٣) چرچ‌ولۆچ لێ دەرکردن بە ڕاوەشاندن.
**shake up,** (١) شڵەقاندن: ڕاوەشاندن‌و تێکەڵ کردن.
(٢) وورووژاندن؛ تێکدان؛ شێواندن
(٣) دڵ داخورپاندن؛ ڕاچڵەکاندن؛ ڕاتەکاندن.
(٤) [Colloq.]، لە بناغەوە ڕێکخستنەوە؛ بە تەواوی گۆڕین:
( to shake up the government)
**the shakes,** [Colloq.], لەرز؛ لەرزوتا.
**shake-down** (shāk'doun'), *n.* (١) جێگەی نوستنی ساکارو سەردەمی (وەك حەسیری سەر زەوی).
(٢) [Slang]، پارە لێ کێشانەوە (بە زۆر یا بە فێڵ‌وتەڵەکە)؛ ڕووتکردنەوە.
(٣) پشکنینی وورد (مرۆڤ، شوێن).
(٤) ماوەی ڕاهاتن (بە کارێك یا دەوروبەر).
***adj.*** [Colloq.], بۆ تاقیکردنەوەو ڕاهاتنە:
( the ~ of a new battleship)
**shaken** (shāk'ən), *past participle of* **shake.**
**shaker** (shāk'ẽr), *n.* (١) ڕاوەشێنەر؛ لەرێنەرەوە.
(٢) دەفری ڕاوەشێن (خوێدان، بێژنگی لەرزۆك...هتد): ***( a salt ~ )*** .
(٣) مەکینەی شڵەقاندن یا ڕاوەشاندن‌و تێکەڵ کردن: ***( a cocktail ~ )*** .
**shaker** (shāk'ẽr), *n.* لەرزۆك؛ بادەر: ئەندامی کۆمەڵێکی ئاینییە لە ئینگلتەرە دەستی پێکرد بڕوای بە پێکەوە ژیان‌و هاوبەشی موڵك‌و ڕەبەنی هەیە (ناوەکەی لە خۆبادان‌و سەماکردنەوە هاتووە لەکاتی ئاهەنگی ئاینیدا).
**Shakespearean; Shakespearian** (shāk-spêr'i-ən), *n.* شکسپیری: تایبەتی بە شکسپیرو نووسینەکانی‌و شێوازی نووسینەکانی؛ شێوازەکەی لە هی نووسینەکانی شکسپیر دەچێت.
***n.*** شکسپیرزان؛ زانای نووسینەکانی بوێژو شانۆگەرو نووسەری بەناوبانگی ئینگلیزی " شکسپیر ".
**Shakespearean sonnet,** هەڵبەستێکی چواردە دێڕییە لە سێ چوار خشتەکی‌و یەك دوو خشتەکی پێکدێت (پێشی دەوترێ: " Elizabethan sonnet " و **"English sonnet "**).
**shake-up** (shāk'up´), *n.* گۆڕین یا ڕێکخستنەوەیەکی بنچینەیی (میری یا دەزگایەك): ***( a cabinet ~ ; a government ~ )*** .
**shakiness** (shāk'i-nis), *n.* لەرزۆکی؛ شلۆقی
**shaking** (shāk'iŋ), *n.* (١) لەرزین (٢) لەرز؛ لەرزوتا؛ مەلاریا.
**shaking palsy,** = **Parkinson's disease.**
**shako** (shak'ō), *n.* تەپلەیەکی سوپایی لوولەکییە پەڕێك دەکرێت بە قەراغی تەوقەسەرەکەیەوە.
**shaky** (shāk'i), *adj.* (١) لەرزۆك: ***( a ~ hand)*** .
(٢) شلۆق؛ لەق؛ لەق‌ولۆق: ***( a ~ table, roof, house, etc.)*** .
(٣) پشت پێ نەبەستراو؛ شلۆق: ***( a ~ truce, alliance, etc.)***
(٤) قلیشاو (دارودرەخت). (٥) پەشۆکاو؛ شڵەژاو.
-shakily *( adv.).*
**shale** (shāl), *n.* بەردی گڵین
**shale Oil,** نەوتی بەرد.
**shall** (shal), *v.* (١) کردارێکە نیشانەی کاتی داهاتووە (ڕێزمان)؛ لە ئایندەدا:
( I ~ be fifty next year. ; We ~ go home tomorrow.)
(٢) کردارێکە سەردەمی دواڕۆژ دەگەیێنێت بە چەند مانایەك (ڕێزمان):
(أ) بەڵێن: ***( Your service ~ be rewarded.)*** .
(ب) مسۆگەری؛ هەر دەبێ ببێ: ***( That day ~ come.)***
(ج) فەرمان: ***( Thou shalt not kill.)*** .
(د) پێویستە (یاسا)؛ دەبێ:
( The penalty ~ not exceed two years in prison.)
(٣) ئایا (پرسیار دەربارەی دواڕۆژ):
( ~ we meet again next week? )
**shalloon** (sha-lōōn', shə-lōōn'), *n.* قوماشێکی خوری میل میلە (بۆ بەری جل بەکاردەهێنرێت).
**shallop** (shal'əp), *n.* = **dinghy.**
**shallot** (shə-lot'), *n.* (١) سەوزەیەکە لە توخمی پیازە سەلکەکەی لە هی سیر دەچێت‌و تامەکەیشی لەنێوان سیرو پیازدایە بە سەوزی لە تەرەپیاز دەچێت. (٢) تەرەپیاز؛ فیسقە.
**shallow** (shal'ō), *adj.* (١) تەنکاو؛ تەنك؛ قووڵ نییە:
( ~ water ; a ~ river, stream, etc.)
(٢) پەل (قاپ، دەفر)؛ پان (دەفر):
( a ~ plate, dish, container, etc.)
(٣) تێ نەگەیشتوو؛ تەنك (مێشك)؛ ڕووکەشی:
( a ~ person, mind, etc.)
***n.*** تەنکاوی ڕووبارێك، گۆمێك، یا دەریاچەیەك.
***v.t. & v.i.*** تەنك کردن؛ تەنکاوبوون.
**shalt** (shalt), شێوەی کەسی دووەمی تاکی سەردەمی ڕانەبردووی کرداری " **shall** " ە. (لەگەڵ " **thou** " بەکاردەهێنرێت ):
***( Thou shalt not kill.)***
**sham** (sham), *n.* (١) فێڵ؛ کەڵەك؛ تەڵەکەبازی؛ فێڵ‌وتەڵەکە.
(٢) شتی قەڵب یا درۆزنە؛ شتی ڕووکەش.
(٣) کەسێکە بە درۆ خۆی بە کەسێك یا جۆرێکی تر پیشان بدات.
(٤) بەرگێکی ڕازاوەی لاسایی.
***adj.*** قەڵب؛ ساختە: ***( ~ pearls)*** .
***v.t.*** (١) هەڵخەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن (٢) بە درۆ وا پیشاندان.
***v.i.*** بە درۆ خۆ وا پیشاندان.
**shaman** (shä'mən, sham'ən), *n.* شامان: (أ) کەشیشی جادووگەر؛ پزیشکی جادووگەر (ووشەی دوایی ببینە).
(ب) پزیشکی جادووگەری هیندییە ئەمەریکاییەکان.
**shamanism** (shä'mən-iz'm), *n.* (١) شامانێتی: بیروباوەڕێکی ئاینی هەندێك گەلانی باکووری ئاسیایە دەڵێت: جیهان پڕە لە فریشتەی باش‌و خراپ وە ئەمانە دەتوانرێ کاریان تێ بکرێ بۆ سوودی مرۆڤ لەڕێی کەشیشی جادووگەرەوە. (٢) ئاینێکی هیندییەکانی ئەمەریکایە لەمە دەچێت
-shamanistic *(adj.).*
**shamble** (sham'b'l), *v.i.* بە ڕێوە ڕۆیشتن بە شل‌وشێواوی‌و تەمەڵانەو پێ بە زەویدا خشان.
***n.*** ڕەوت یا بەڕێوە ڕۆیشتنێکی شل‌وشێواوو تەمەڵانە.
**shambles** (sham'b'lz), *n.pl.* (١) دووکانی گۆشتفرۆش؛ فرۆشگای گۆشت. (٢) قەسابخانە؛ کوشتارخانەی ئاژەڵ.
(٣) شوێنی خوێن ڕشتن؛ کوشتارخانە.
(٤) وێرانە؛ کەلاوە؛ شوێنی شێواوو بەسەریەکدا دراو:

*( The children left the house in a ~ .;*
*The earthquake left the town in a ~ .)*

**shame** (shām), *n.* (١) شەرم؛ ئابڕوو؛ پەردەی شەرم؛ نامووس؛ حەیا *( Have you no ~ ?)* .
(٢) مایەی ڕیسوایی و ڕووڕەشی.
(٣) ڕووڕەشی؛ ڕیسوایی؛ ئابڕووچوون؛ سەرشۆڕی؛ شەرمەزاری:
*( He brings ~ upon his name.)*
(٤) نائومێدی؛ دڵ شکستی:
*( It's a ~ you can't come to the picnic.)*
*v.t.* (١) شەرمەزارکردن.
(٢) سەرشۆڕی هێنان بەسەردا؛ ئابڕووبردن؛ حەیابردن؛ ڕیسواکردن.
(٣) ( ~ into ; ~ out of )، شەرمەزارکردن بۆ پێ کردنی شتێك:
*( He was ~d into an apology. )*
**for shame!** ئابڕووت بێ''؛ حەیات بێ'!؛ حەیا چوونە'!؛ داوەشێنە'!.
**put to shame,** (١) شەرمەزارکردن.
(٢) بەزاندن؛ لێ بردنەوە (پێشبڕکێ)؛ بۆڕپێدان.
**shame on you !,** داوەشێنێت'!؛ ئابڕووت چێ'!؛ حەیات چێ'!.

**shamefaced** (shām′fāst´), *adj.* (١) شەرمن؛ بە ئابڕوو؛ بە حەیا.
(٢) شەرمەزار؛ ڕووڕەش؛ چاوشۆڕ.
**-shamefacedly** *(adv.)* ; **shamefacedness** *(n.)*.

**shameful** (shām′fəl), *adj.* (١) شەرمەزارکەر؛ ڕووڕەشکەر؛ حەیابەر؛ زۆر ناشرین (ڕەووشت، کردار )؛ ئابڕووبەر؛ شوورەیی:
*( ~ behavior ; a ~ act )*
(٢) [Archaic]، شەرمەزار؛ ڕووڕەش؛ چاوشۆڕ.
**-shamefully** *(adv.)*; **shamefulness** *(n.)*.

**shameless** (shām′lis), *adj.* (١) بێ شەرم؛ بێ ئابڕوو؛ بێ حەیا؛ بێ نامووس؛ ڕووهەڵماڵراو. (٢) ناشرین (کردەوە)؛ ڕووڕەشکەر؛ بێ شەرمی دەگەیێنێت.
**-shamelessly** *(adv.)* ; **shamelessness** *(n.)*.

**shammy** (sham′i), *n.* = **chamois.**

**shampoo** (sham-pōō′), *v.t.* (١) هەنوون؛ شێلان.
(٢) سەرشتن بە شامپوو.
*n.* (١) شتنی سەر بە شامپوو.
(٢) شامپوو: سابوونێکی تایبەتییە بۆ سەرشتن.

**shamrock** (sham′rok), *n.* سێپەڕە گیایەکە لە سێپەڕە دەچێت (درووشمی ئێرلەندەیە).

**shandrydan** (shan′dridan´), *n.* [Dial], (١) گالیسکەیەکی دوو پێچکەیی یەك ئەسپییە. (٢) گالیسکە یا ئوتومبیلێکی شەق وشڕ.

**shandygaff** (shan′di-gaf´), *n.* خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەرە لە بیرەو زەنجەفیل پێکدێت.

**shanghai** (shaŋ´hi′, shäŋ′hī′), *v.t.* (١) سەرخۆشکردنی کەسێك و فڕاندنی بۆسەر کەشتییەك بۆ ئیش پێکردن وەك کەشتییەوان.
(٢) فریودان؛ هەڵفریوان؛ لەخشتەبردن؛ تەفرەدان؛ بە فێڵ وتەڵەکەو هەڕەشە شت پێکردن.

**shangri-La** (shaŋ′gri-lä´), *n.* یوتۆپیا بەهەشتی سەرزەمین؛ شوێنێکی خۆش و پڕ ئاسوودەو تەریك.

**shank** (shaŋk), *n.* (١) لوولاق: ئەو بەشەی لاقە کە لەنێوان ئەژنۆو پاژنەی پێدایە (لە مرۆڤ و وڵاخدا). (٢) لاق.
(٣) پارچەیەك گۆشتی لوولاق (گا، مەڕ). (٤) قەدی بزمارو دەرزی.
(٥) لاسکی ڕووەك؛ قەف. (٦) قەفی قولاپی ماسی. (٧) دەسکە سەبیل.
(٨) قەدی کلیل: ئەو بەشەی لەنێوان قنگەکەی و دانەکانیدایە.
(٩) دەسکی کەوچك.
(١٠) (ا) ئەو بەشە تەسکەی بنی پێڵاوە کە لەنێوان پاژنەکەی و پانایییەکەیدایە.
(ب) پارچەیەك ئاسنە دەخرێتە ناو پێڵاوەوە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم بەشەی پێڵاو. (١١) قەدی درەوشەو ئامێری کونکەری تر.
(١٢) [Colloq.]، (ا) دوا بەشی یا دوادوایی شتێك (بەتایبەتی کات):
*( the ~ of the journey)*
(ب) بەشی یەکەم یا باشترینی کاتێك: *( the ~ of the evening)*
*v.i.* ووشکبوون و لە لاسك کەوتنەخوارەوە (گوڵ).

**shan't** (shant, shänt), = **shall not.**

**shantey** (shan′ti, shän′ti), *n.* = **chantey.**

**shanty** (shan′ti), *n.* = **shack.**

**shantyman** (shan′ti-mən), *n.* کۆختەنشین (بەتایبەتی دارکەر).

**shanty-town** (shan′ti-toun´), *n.* شاری کۆختە؛ گەڕەکی قۆختە؛ زنجخانە.

**shape** (shāp), *n.* (١) شێوە؛ وێنە. (٢) شێوەی کەسێك.
(٣) قەدو باڵا؛ بیچم.
(٤) شێوەی درۆ؛ بەرگ (مەجاز): *( an enemy in the ~ of a friend)*
(٥) تارمایی؛ خێو؛ شەبەنگ. (٦) قاڵب.
(٧) جۆر؛ شێوە: *( dangers of every ~ )* .
(٨) شێوەی ڕێك وپێك؛ ڕێك وپێکی: *( His story began to take ~ .)* .
(٩) دەق.
(١٠) [Colloq.]، بار (بەتایبەتی هی تەندرووستی)؛ دۆخ:
*( The injured man was in bad ~ .; You are in good ~ .)*
*v.t.* (١) درووستکردن؛ شێوەپێدان؛ ڕێکخستن؛ دەق پێ بەستن.
(٢) داڕشتن؛ ڕێك وپێك کردن.
(٣) گونجاندن؛ شیاندن: *( ~ your plans to your abilities.)*
(٤) ڕێباز بۆ دیاری کردن؛ بڕیاری شێوەی ژیان بۆ دان:
*( The war ~d their lives.; His teachers ~d his character.)*
(٥) [Obs.]، فەرمان دان؛ بڕیاردان.
*v.i.* (١) گونجان؛ شیان.
(٢) [Rare]، ڕوودان.
(٣) پێکهاتن؛ شێوەیەکی تایبەتی وەرگرتن؛ بەرەو پێشەوە چوون:
*( Our plans are ~ing well.)*
**shape up,** [Colloq.], (١) شێوەیەکی تایبەتی وەرگرتن.
(٢) بەرەو باشی چوون؛ باشتربوون.
(٣) ڕەووشتی خۆ چاك کردن یا گۆڕین؛ هاتنە سەر ڕێی ڕاست:
*( From this day on you're going to shape up or shape out.)*
**take shape,** پێکهاتن؛ پەرەسەندن؛ بەرەو پێشەوە چوون.

**shapeless** (shāp′lis), *adj.* (١) بێ شێوە؛ بێ دەق؛ لە هیچ ناچێت.
(٢) ناشرین؛ ناڕێك وپێك.
**-shapelessly** *(adv.)* ; **shapelessness** *(n.)*.

**shapely** (shāp′li), *adj.* شێوە جوان؛ قەدو باڵا جوان؛ ڕێك وپێك؛ خڕومڕ؛ خڕپن: *( a ~ fugure)* .
**-shapeliness** *(n.)*.

**shard** (shärd), *n. Also* **sherd,** (١) پارچەی شکاوی شووشە یا کانزا.
(٢) بەرگی تەنکی دەرەوەی باڵی قالۆنچە.
(٣) کیفی ڕەق (گیانەوەرناسی)؛ قاوغ.

**share** (shâr), *n.* (١) بەش؛ پشك؛ بەرکەوت.
(٢) بەشی تەواوی خۆ: *( Everyone has done his ~ of work.)*
(٣) یەك بەشی کۆمپانیای هاوبەشی.
*v.t.* (١) بەش کردن؛ دابەش کردن.
(٢) هاوبەشی کردن؛ بەش کردن لەگەڵدا:
*( ~ the candy with your playmates.)*
*v.i.* ( ~ in ), بەشداربوون تێدا؛ بەشداری کردن تێدا.
**go shares,** بە هاوبەشی کردن؛ پێکەوە وەك یەك بەشداربوون.
**on shares,** هاوبەشی کردن لە سوودو زیانیشدا.

**share** (shâr), *n.* = **plowshare.**

**sharecrop** (shâr′krop′), *v.i. & v.t.* بەشێك لە بەرهەمی کشتوکاڵ بردن لەبری ئیش.

**sharecropper** (shâr′krop´ēr), *n.* وەرزێرێکە کە بەشێك لە
بەرهەمی کشتوکاڵەکەی دەبات لەبری ئیشەکەی

**shareholder** (shâr′hōl´dēr), *n.* بەشدار (لە کۆمپانیای هاوبەشیدا)؛
خاوەن بەش؛ هاوبەش.

**shark** (shärk), *n.* (١) دەستبڕ؛ ساختەچی؛ جامباز؛ تەڵەکەباز.
(٢) [Slang]. شارەزا؛ بزان؛ زانای ڕشتەیەکی تایبەتی.
***v.t.*** [Archaic], دەستبڕین؛ بە جامبازی دەست کەوتن.
***v.i.*** دەستبڕی کردن؛ بە ساختەچێتی ژیان.

**shark** (shärk), *n.* سەگەماسی؛ کۆسە؛ جۆرە ماسی‌یەکی گەورەو دڕی
ماسی خۆرە هەندێکیشیان پەلاماری مرۆڤ دەدەن.

**sharkskin** (shärk′skin´), *n.* (١) پێستی کۆسە.
(٢) قایشێکە لە پێستی کۆسە دروست دەکرێت.
(٣) قوماشێکی لووسی نەختێك بریقەدارە.

**sharp** (shärp), *adj.* (١) تیژ؛ بڕ. ***( a ~ knife)*** .
(٢) نووکدار؛ تیژ (٣) تیژ (پێچ، لوفە): ***( a ~ turn)*** .
(٤) دیار؛ زۆر دیار؛ لەبەرچاو؛ ئێجگار:
***( a ~ difference, contrast, etc.)***
(٥) زیرەك؛ دانا؛ زرنگ؛ تیژ: ***( a ~ mind, person, etc.)*** .
(٦) (ا) وریا (ب) تیژ: ***( ~ eyes)*** .
(٧) فێڵباز؛ تەڵەکەباز؛ زۆرزان؛ زۆڵ.
(٨) بڕ (ووشە، ڕەخنە)؛ توندوتیژ:
***( He had some ~ words for him.; ~ criticism)***
(٩) توند (هێرش)؛ توندوتیژ.
(١٠) سارد؛ بڕ؛ تیژ: ***( a ~ wind)*** .
(١١) تیژ (ئازار)؛ زۆر؛ بڕندە: ***( a ~ pain)***
(١٢) تیژ (تام، بۆن)؛ توون.
(١٣) بەرزو ناساز (دەنگ)؛ تیژ.
(١٤) بەتین؛ بریقاوە؛ زۆر ڕووناك: ***( a ~ flash of light)*** .
(١٥) (ا) شۆخ؛ قۆز؛ تەڕپۆش؛ جوان.
(ب) کەشخە (جل‌وبەرگ)؛ جوان؛ ڕێك‌وپێك:
***( a ~ jacket, suit, dress, etc.)***
(١٦) بی دەنگ (تیپ: دەنگناسی).
(١٧) بەرزتر لە ئاسایی (مۆسیقا و گۆرانی).
***n.*** (١) دەرزی درووماانی نووك زۆر باریك‌و تیژ.
(٢) [Colloq.]. زانا؛ شارەزا؛ بزان. (٣) [Colloq.]، **sharper** .
(٤) (ا) ئاوازێکی بەرزتر لە ئاسایی. (ب) نیشانەی ئەم جۆرە ئاوازە.
***v.i.*** مۆسیقالێدان یا گۆرانی ووتن بە دەنگی بەرزتر لە پێویست.
***adv.*** (١) لەپڕ؛ بە پەلە؛ خێرا. (٢) بە وریایی. (٣) بە تیژی.
(٤) بەرزتر لە هی ڕاست یا پێویست (ئاوان).
(٥) تەواو (کات)؛ بە تەواوی؛ بەبێ کەم‌و زیاد:
***( She came at seven o'clock ~ .)***
**-sharply** ***(adv.)*** ; **sharpness** ***(n.)***.

**sharp-eared** (shärp′êrd´), *adj.* (١) گوێ قوت؛ گوێ ڕەپ.
(٢) گوێ سووك.

**sharp-edged** (shärp′ejd´), *adj.* تیژ؛ دەم تیژ؛ بڕ.

**sharpen** (shär′p'n), *v.t.* تیژکردن (چەقۆ، گوێزان، پێنووس)؛
داداز (پێنووس)؛ تیژکردنەوە.
***v.i.*** تیژبوون.

**sharper** (shär′pēr), *n.* دەستبڕ (بەتایبەتی قومارچی)؛ گزیکەر؛
ساختەچی؛ فێڵباز

**sharp-eyed** (shärp′id´), *adj.* (١) چاوتیژ
(٢) وریا؛ هۆشیار؛ بە سەرنج.

**sharpie** (shär′pi), *n.* (١) جۆرە بەلەمێکی بایەوانی باریك‌و درێژو
بن تەختی ڕاوەماسی‌یە (٢) [Colloq.]. کەسێکی وریا و زیرەك‌و قسە قوت.

**sharp-nosed** (shärp′nōzd´), *adj.* (١) لووت تیژوباریك
(٢) نووك تیژ؛ لووتکەدار؛ سەرتیژ.
(٣) هەستی بۆن کردنی تیژە.

**sharp-set** (shärp′set´), *adj.* (١) بە پەرۆش؛ زۆر برسی
(٢) ئامادەیە بۆ بڕین یا بڕینەوە (مشار...هتد).

**sharp-shooter** (shärp′shōōt´ēr), *n.* نیشانچی؛ نیشان شکێن.

**sharp-sighted** (shärp′sīt´id), *adj.* = **sharp-eyed.**

**sharp-tongued** (shärp′tuŋd´), *adj.* دەم درێژ؛ زمان درێژ؛
زمان پیس.

**sharp-witted** (shärp′wit´d), *adj.* زیرەك؛ مێشك تیژ؛
مێشکی وەك ددانی مارە.

**shatter** (shat′ēr), *v.t.* (١) ووردوخاش کردن: ***( to ~ a window)*** .
(٢) وێران کردن؛ تێکدان؛ فەوتاندن؛ تێك‌وپێکدان؛ لەناوبردن:
***( to ~ one's hopes, nerves, etc.)***
(٣) [Obs.]، پەرش‌و بڵاوکردنەوە.
***v.i.*** (١) ووردوخاش بوون؛ شکان. (٢) تێکچوون؛ فەوتان؛ وێران بوون
***n.*** (١) ووردوخاش بوون؛ شکان.
(٢) (*pl.*)، پارچە پارچە؛ پارچەی ووردوخاش؛ وورده پارچە:
***( The broken vase lay in ~s.)***
(٣) ووردوخاشی؛ شکاوی.

**shatter-proof** (shat′ēr-prōōf´), *adj.* ووردوخاش نابێ:
***( ~ glass)***

**shave** (shāv), *v.t.* (١) تاشین (دار)؛ ڕەندەکردن.
(٢) تاشین (ڕیش)؛ تەراش کردن. (٣) ڕووشاندن.
(٤) بڕین (چیمەن، گیا).
(٥) [Colloq.]، نرخ داشکاندن؛ نرخ هێنانەخوارەوە.
(٦) بە نرخێکی کەمتر لە ئاسایی کڕین (سەوداگەری).
***v.i.*** (١) تەراش کردن؛ ڕیشی خۆ تاشین.
(٢) بە چنگەکڕێ دەربردن (پارەبازی).
***n.*** (١) (ا) ڕەندە (ب) مەکینەی ڕیش تاشین.
(٢) تەڵاش؛ ئاردە مشار؛ پرووشەدار.
(٣) تەراش؛ ڕیش تاشین: ***( a sharp razor means a good ~ )***
(٤) [Colloq.]، زۆر لێ نزیکبوونەوە بەبێ لێدان یا بەرکەوتن.
**a close shave,** [Colloq.], بە حاڵ دەربازبوون؛ بە حاڵ ڕزگاربوون.

**shaveling** (shāv′liŋ), *n.* (١) کەسێکی سەرتاشراو یا پاك کراو
بەتایبەتی کەشیش (لەڕووی سووکی‌یەوە) (٢) لاو؛ گەنج؛ هەرزە.

**shaven** (shāv′'n), alternative past participle of **shave.**
***adj.*** (١) تاشراو. (٢) باش کورتکراوەتەوە.

**shaver** (shāv′ēr), *n.* (١) تەراشکەر؛ ڕیش تاش.
(٢) مەکینەی ڕیش تاشین: ***( an electric ~ )*** .
(٣) [Archaic]، دەستبڕ؛ تەڵەکەباز؛ ساختەچی.
(٤) [Colloq.]، لاو؛ گەنج؛ هەرزە؛ منداڵ.

**shave-tail** (shāv′tāl´), *n.* (١) هێستری تازە گیراو.
(٢) ئەفسەری یەك ئەستێرەی تازە (لەڕووی سووکی‌یەوە).

**shaving** (shāv′iŋ), *n.* (١) (ا) ڕیش تاشین؛ تەراش کردن؛ تاشین.
(ب) ڕەندەکردن؛ تاشین (دار).
(٢) تەڵاش؛ ئاردە مشار؛ وورده توێکڵ؛ پرووشەدار؛ پرووش (پەنیر، کانزا):
***( wood ~ )***

**shaving brush,** فلچەی ڕیش تاشین.

**shaving cream,** سابوونی ڕیش تاشین.

**shaw** (shô), [Archaic or Dial.], بێشە؛ بێشەلان؛ چڕستان؛ زەبەنگ.

**shaw** (shô), *n.* گەڵاو لاسکی شێلم‌و پەتاتە...هتد.

**shawl** (shôl), *n.* دەستماڵ؛ چارۆکەی سەرشان؛ شاڵ.

**shawm** (shôm), *n.* ئامێرێکی فووپیاکردنی مۆسیقی کۆنە.

**shay** (shā), *n.* [Colloq.], = **chaise.**

**she** (shē, shi), *pron.* (١) ئەو (ژن و گیانداری مێ).

(۲) راناویکه بەکاردەهێنرێ بۆ ئەو شتانەی بە مێ دانراون (وەك: کەشتی،
زەمیز، هتد).
*n.* کچ؛ ژن؛ گیانداری مێینە: *( Our dog is a ~ .)*.
**she-** (shē), پێشگرێکە بەمانای: مێ؛ مێینە؛ ما:
*( ~ - ass ; ~ - cat ; ~ - bear)*
**sheaf** (shēf), *n.* (۱) چەپك؛ دەسك؛ دەستە؛ مەلۆ؛ قول؛ گوورزە
(۲) پڕ تیردانێك تیر.
(۳) بەستەك (کاغەز)؛ دەستە: *( a ~ of papers)*.
*v.t.* مەلۆکردن؛ گوورزەکردن؛ چەپك چەپك کردن؛ پێچانەوە؛ بەستن.
**shear** (shêr), *v.t.* (۱) بڕینەوە (مەڕ، بزن، خوری).
(۲) تووك یا بەرگی لێکردنەوە؛ تاشین. (۳) بڕینەوە.
(٤) لێ سەندنەوە (ماف، دەسەلات)؛ بێ بەش کردن.
(٥) [Dial.] دوورینەوە (بە داس)؛ درووێنەکردن.
*v.i.* (۱) (أ) برنگ بەکارهێنان؛ بڕینەوە؛ قەڵەم کردن (ب) بە داس دوورینەوە.
(۲) لەیەکبوونەوە؛ شەق بردن
(۳) پێدا ڕۆیشتن؛ بڕین (مەجاز)
*( The plane ~ed through the clouds.)*
*n.* (۱) (أ) برنگ؛ مەقەستی گەورە (ب) پەلێکی برنگ یا مقەست
(۲) ئامێری بڕینەوە (بەتایبەتی هی تەبەقە کانزا).
(۳) بڕینەوە (مەڕ، بزن، کانزا... هتد).
(٤) بەرگر؛ مەڕوبزنی بڕاوە.
(٥) بڕینەوەیەك. واتە سالێك: ڕێگەیەکە بۆ دیاری کردن یا ژماردنی تەمەنی
مەڕ *( a sheep of three ~s)*.
(٦) shearing stress.
-shearer *(n.)*.
**shearing** (shêr′iŋ), *n.* (۱) بڕینەوە (مەڕ، بزن)
(۲) بەرگر: ئەو خوری و مووەی لە بڕینەوەیەکدا لە مەڕ یا بزن دەکرێتەوە.
**shearing stress,** ئەرکی سەر دوو پارچە ئاسنی لەیەککەوتوو لەکاتی
کارکردند: (وەك دوو پەلی برنگ).
**shear legs,** *Also* **shear-legs,** مەکینەی شتی قورس بەرزکردنەوە.
**shearling** (shêr′liŋ), *n.* (۱) مەڕی یەك جار بڕاوە؛ شەك؛
بەرخی یەك ساڵە. (۲) پێستەی شەك یا بەرخ بە بەرگنەکەیەوە.
**shears** (shêrz), *n.pl.* (۱) برنگ؛ مقەستی گەورە
(۲) ئامێری کانزاو شتی تر بڕینەوە. (۳) **shear-legs**
**shear-water** (shêr′wô′tẽr), *n.* ئاوبڕ: باڵندەیەکی دەریایی ڕەش و
سپی دەنووك نوشتاوەی باڵ درێژە ئەوەندەی کۆترێك دەبێت کە دەفڕێت لەوە
دەچێت کە بەسەر ئاوەکەدا بخشێت یا بیبڕێت.
**sheatfish** (shēt′fish′), *n.* ماسییەکی زۆر گەورەی ڕووباری
ئەوروپایییە (هەندێکیان سەدوپەنجا کیلۆ دەبن).
**sheath** (shēth), *n.* (۱) کێلان؛ کیف. (۲) بەرگ.
(۳) کراسی تەسکی ئافرەت.
*v.t.* خستنە کێلانەوە.
**sheath-bill** (shēth′bil′), *n.* دەنووك کێلانی: باڵندەیەکی دەریایی
سپی ناوچەکانی تەوەری باشوورە کیفێك بە ژێر دەنووکییەوەیە.
**sheathe** (shē*th*), *v.t.* (۱) خستنە کێلانەوە
(۲) بەرگ تێگرتن؛ داپۆشین (بۆ پاراستن).
(۳) کردن بە گۆشتدا (شیر)
(٤) چڕنووك کێشانەوە ناو کیفەوە
**sheathing** (shē*th*′iŋ), *n.* (۱) (أ) خستنە کێلانەوە. (ب) بەرگ تێگرتن.
(۲) بەرگ
**sheath knife,** چەقۆی کیفدار
**sheave** (shēv), *n.* پێچکەی قەراغ چاڵ (وەك هی خولخولۆکە)
**sheave** (shēv), *v.t.* چەپك کردن؛ گوورزەکردن؛ پێچانەوە؛ بەستن.
**sheaves** (shēvz), *n. plural of* **sheaf** *and* **sheave.**
**shebang** (shə-baŋ′), *n.* [Slang], کاروبار؛ دەزگا؛ شت؛ هەرامە.
(بەتایبەتی لەم دەستەواژەیەدا: **the whole shebang**).
**shebeen** (shi-bēn′), *n.* [Irish and Scot.], مەیخانەی قاچاغ.
**shed** (shed), *n.* سایەبان؛ چەرداخ؛ کەپر؛ کەپری ئاژەڵ؛ زنج؛ سابات.
**shed** (shed), *v.t.* (۱) ڕژاندن (خوێن، فرمێسك)؛ ڕشتن؛ ڕژان:
*( to ~ blood, tears, etc.)*
(۲) لێ بوونەوە؛ بلاوکردنەوە؛ دانەوە؛ لێ هاتنەدەرەوە:
*( He ~s confidence wherever he goes.)*
(۳) نەگرتنە خۆ؛ لێ دوورخستنەوە؛ پێوە نەنووسان:
*( A duck's feathers ~ water.)*
(٤) فڕێدان (تووك، کاژ)؛ وەرین؛ لێ بوونەوە؛ ڕووتانەوە: *( to ~ skin)*
*v.i.* (۱) فڕێدان (تووك، کاژ)؛ ڕووتانەوە.
(۲) وەرین: *( All the leaves have ~ .)*.
*n.* = **watershed.**
**shed blood,** خوێن ڕشتن؛ کوشتن.
**she'd** (shēd),= **she had, she would.**
**shedder** (shed′ẽr), *n.* (۱) تووك یا کاژ فڕێدەر؛ قژ یا تووك ڕووتاوە.
(۲) قرژانگ و کوللەی دەریا لەکاتی قاوغ فڕێداندا یا دوای.
**shedding** (shed′iŋ), *n.* (۱) کاژ یا تووك فڕێدان.
(۲) تووك یا کاژو شتی تری فڕێدراو یا لێ بووەوە.
**she-devil,** ئافرەتی بەدخوای کینەداری دڵڕەق.
**sheen** (shēn), *n.* (۱) تریفە؛ بریقە؛ بریسکە.
(۲) جلی بریقەدار؛ بەرگی بریسکەدار.
*adj.* [Poetic]. بریقەدار؛ بریسکەدار؛ بە تریفە؛ جوان.
*v.i.* [Poetic], بریقەدانەوە؛ بریسکەدان.
**sheeny** (shēn′i), *adj.* بریقەدار؛ بریسکەدار.
**sheep** (shēp), *n.* (۱) مەڕ؛ پەز. (۲) پێستە مەڕ.
(۳) کەسێکی ملکەچ و ترسنۆك و بێ دەسەلات و بێ مێشك و سەرکز.
**make sheep's eyes at,** بە شەرمەوەو بە خۆشەویستانەو دلدارانە
سەیرکردن.
**sheepberry** (shēp′ber′i, shēp′bẽr-i), *n.* درەختێکی گوڵ
سپی بەر تووترکییە.
**sheepcote** (shēp′kot′), *n.* = **sheepfold.**
**sheep-dip** (shēp′dip′), *n.* گیراوەیەکی کیمیایییە مەڕی
تێهەڵدەکێشرێت بۆ کوشتنی گەنەو زڕچ و جانەوەری ترو پاکردنەوەی.
**sheep dog,** *Also* ( **sheep-dog** ), *n.* سەگی شوان: سەگێکی گەورەی
هێمنی تیسك درێژە فێری بەدیارەوەبوون و پاسەوانی مێگەلە.
( پێشی دەووترێ: " **Old English sheepdog** ").
**sheepfold** (shēp′fōld′), *n.* پەچە؛ کۆز.
**sheepherder** (shēp′hũr′dẽr), *n.* شوان.
(هەروەها " **shepherd** ").
**sheepherding** (shēp′ẽrd′iŋ), *n.* مەڕ لەوەڕاندن؛ شوانی کردن.
**sheepish** (shēp′ish), *adj.* (۱) شەرمن؛ زوو تەریق بووەوە؛ کەم ڕوو:
*( a ~ look)*
(۲) ترسنۆك؛ ماڵی؛ ملکەچ.
-sheepishly *(adv.)* ; sheepishness *(n.)*.
**sheep-kill** (shēp′kil′), *n.* = **sheep laurel.**
**sheep laurel,** مەڕکوژە: دەوەنێکی هەمیشە سەوزی ژەهراوییە
مەڕ دەکوژێ (پێشی دەووترێ: " **lambkill** ").
**sheep's eyes,** سەیرکردنی شەرمنانەو خۆشەویستانە:
*( She was making ~ at him.)*
**sheepman** (shēp′man′, shēp′mən), *n.* (۱) مەڕ بەخێوکەر.
(۲) **sheepherder**.
**sheep run,** = **sheepwalk.**
**sheepshank** (shēp′shaŋk′), *n.* (۱) لوولاقە مەڕ.
(۲) گرێی پەت کورتکردنەوە.

(۳) [Scot.]. شتێکی هیچ‌وپووچ؛ شتێکی ناسك، بێ هێز، یا باریکه‌له.
**sheepshead** (shēps′hed′), *n.* (۱) کەللەی مەڕ (بۆ خواردن).
(۲) کەسێکی کەرو بێ مێشك؛ کەسێکی هیچ‌وپووچ.
(۳) ماسی‌یەکی دەریایی گەورەی سەر زل بازووە.
**sheep-shearer** (shēp′shêr′ēr), *n.* (۱) مەڕ بڕەرەوە.
(۲) بڕنگ؛ مەکینەی مەڕ بڕینەوە.
**sheep-shearing** (shēp′shêr′iŋ), *n.* (۱) مەڕ بڕینەوە.
(۲) کاتی مەڕ بڕینەوە. (۳) ئاهەنگی مەڕ بڕینەوە.
**sheepskin** (shēp′skin′), *n.* (۱) پێستە مەڕ بە کولکەکەیەوە.
(۲) پێستەی نووسین؛ کاغەزی پێستە.
(۳) [Colloq.]. بڕوانامەی قوتابخانە؛ دبلۆم.
**sheep sorrel,** ترشۆکە. گیایەکی کێویلەیە گەڵاکەی لە سڵق دەچێت تامەکەی ترشە.
**sheepwalk** (shēp′wôk′), *n.* لەوەڕگای مەڕ.
**sheer** (shêr), *v.i.* لە ڕێ لادان (کەشتی)؛ لادان.
*v.t.* لە ڕێ پێ لادان.
*n.* (۱) لە ڕێ لادان (کەشتی)؛ لادان.
(۲) ڕادەی لاربوونەوەی کەشتی (کە لە لاوە ببینری).
**sheer away ( or off ),** جیابوونەوە (لە تاقمە خەڵك)؛ بەجێهێشتن؛ لە باس لادان یا گۆڕین (لەبەر ناخۆشی باسەکە).
**sheer** (shêr), *adj.* (۱) زۆر تەنك (کاڵا)؛ ڕۆشن.
(۲) تەواو؛ بێ کەم‌وزیاد؛ هەر؛ تەنها؛ ڕووت:
***( It was ~ folly, ignorance, etc..; a ~ accident; a ~ waste of time)***
(۳) هەزار بە هەزار؛ سەخت؛ ستوونی؛ زۆر لێژ؛ یەکسەر چووە بە ئاسماندا:
***( a ~drop; a ~ cliff)***
***adv.*** (۱) بە تەواوی؛ بەبێ کەم‌وزیاد؛ ڕووت؛ هەر؛ تەنها.
(۲) یەکسەر بۆ خوارەوە؛ بە لێژی؛ بە ستوونی؛ بە هەزار بە هەزاری.
*n.* کاڵای زۆر تەنك؛ بەرگی لەم کاڵایە دروستکراو.
**sheer legs,** = **shear legs.**
**sheet** (shēt), *n.* (۱) سەر دۆشەك؛ بەرگە دۆشەك؛ چەرچەف؛ مێتیل.
(۲) [Poetic]، بایەوان.
(۳) (ا) پەڕە (کاغەز)؛ تەبەق: ***( a ~ of paper)*** .
(ب) ڕۆژنامە.
(٤) پەڕە (ئاسن)؛ تەبەق (سەهۆڵ، شووشە)؛ تەختە (دار، شووشە):
***( a ~ of ice, glass, iron, plywood, etc.)***
(٥) تەختەبەرد (زەمینناسی).
(٦) تەبەقە پوول (پێش جیاکردنەوەیان لەیەك).
***v.t.*** داپۆشین (بە مێتیل، تەبەقە شووشە، سەهۆڵ یا ئاسن)؛ بەرگ تێگرتن.
**sheet** (shēt), *n.* پەتی بایەوان
***v.i.*** درێژبوونەوەی پەتی بایەوان بە لایەکدا.
**three sheets to the wind,** [Colloq.], سەرخۆش.
**sheet anchor,** (۱) لەنگەری گەورەی تەنگانەی کەشتی.
(۲) دوا پەنا؛ دوا داڵدە؛ کەسێك یا شتێکە کە لە تەنگانەدا دەکەوێتە فریا.
**sheet bend,** قوڵفە گرێ: بریتی‌یە لە گرێدانی پەتێك بە قوڵفەکەیەوە (کەشتیوانی)
**sheet glass,** تەبەقە شووشە؛ تەختە شووشە.
**sheeting** (shēt′iŋ), *n.* (۱) بەرگ تێگرتن؛ بە تەختەدار یا تەبەقە کانزا یا قوماش داپۆشین. (۲) لۆکەو کەتانی چەرچەف لێ دروستکراو.
(۳) پەڕەی تێگیراو؛ بەرگ (تەبەقە ئاسن، تەختەدار، مێتیل...هتد):
***( copper ~ )***
**sheet iron,** تەبەقە ئاسن.
**sheet metal,** پەڕەی کانزایی؛ تەبەقە کانزا.
**sheet music,** مۆسیقای چاپکراو لەسەر پەڕەی بەند نەکراو.
**sheik, sheikh** (shēk, shāk), *n.* (۱) (ا) شێخ (ئاین)
(ب) سەرەك خێڵی عەرەبی. (۲) [Slang]، پیاوی قۆزی ژن بۆ شێت بوو؛ ژنکوژ.
**sheikdom, sheikhdom** (shēk′dəm), *n.* شێخ نشین.
**sheitan** (shi-tän′), *n.* = **shaitan.**
**shekel** (shek′'l), *n.* (۱) کێشانەیەکی بابلی و جوولەکەی کۆنە.
(۲) پارەیەکی ئاڵتوون یا زیوی جوولەکەی کۆنە.
(۳) [Slang] (*pl.*)، پارە (بەتایبەتی هی وردە).
**sheldrake** (shel′drāk′), *n.* جۆرە مراوی‌یەکی ڕەش‌وسپی‌یە.
**shelf** (shelf), *n.* (۱) ڕەفە؛ تاق.
(۲) شتی سەر ڕەفە؛ ئەوەندە شتومەك کە جێی ببێتەوە لەسەر ڕەفەیەك.
(۳) تەختەبەری سەردەرهێناو لە کەندەڵانێکەوە وەك ڕەفە.
(٤) ڕەفە یا تیرەیەکی بەردینی تەنکاوی گوێ دەریا.
(٥) تەختەبەردی ژێر زیخ و گڵ (کانگەری).
**on the shelf,** بێکار (پیاوی پیر، کچی قەیرە)؛ بێ کەڵك؛ خراوەتە پشت گوێ؛ خراوەتە لاوە؛ بەکارنەماو.
**shell** (shel), *n.* (۱) قاوغ (کیسەڵ، گوێچکەماسی)؛ لەپکە؛ قاقلە؛ سەدەف.
(۲) توێکڵ (هێلکە، پاقلە، گوێز، بادەم، تۆو)؛ قاوغ؛ قاپۆر؛ قالۆر.
(۳) بەرگێك یا شتێکی لە قاوغ چوو: (ا) چوارچێوە یا قاوغی خانوو.
(ب) قاوغی پاقلاوە و کێك و کولیچە.
(ج) قاوغی بەلەم و کەشتی. (د) گوێچکە.
(٤) شتێکی بۆش و ڕووالەتی (کردار، هەڵوێست...هتد)؛ شتی بێ ناوەڕۆك یا ناوناخن. (٥) بەلەمی سەوڵی باریك و درێژی پێشبڕکێ.
(٦) بۆمبا. (٧) قاوغە فیشەك؛ قاپۆر؛ قاوغە گوللە.
(٨) گوێچکەماسی؛ گیانداری دەریایی نەرمی قاوغدار.
***v.t.*** (۱) توێکڵ لێکردنەوە؛ پاك کردن:
***( to ~ peas, shrimp, etc. )***
(۲) دەنکی گەنمەشامی کردنەوە لە گوڵەشامی.
(۳) بۆمباران کردن؛ بۆمبا پێوەنان؛ تۆپ پێوەنان.
***v.i.*** توێکڵ لێ بوونەوە: ***( Peanuts ~ easily.)*** .
**come out of one's shell,** شەرم شکان و چوونە ناو خەڵکەوە؛ لە قاوغی خۆ هاتنەدەرەوە؛ هاتنەدەرەوە بۆناو کۆمەڵ.
**retire into one's shell,** چوونە ناو قاوغی خۆوە؛ شەرم گرتن؛ لە کۆمەڵ کشانەوە.
**shell out,** [Colloq.], پارەدان؛ جرنگاندن؛ دانەدەست:
***( He shelled out a large sum of money.)***
**she'll** (shēl), = **she shall, she will.**
**shellac, shellack** (shə-lak′), *n.* (۱) جەوی " لەك" ی پاڵێوراو (ووشەی " **lac** " ببینە). (۲) بۆیەیەکی ڕوونە لە "لەك"و کحوول پێکدێت: شلاووکی " لەك".
***v.t.*** (۱) شلاووك یا جەوی " لەك" لێدان.
(۲) [Slang]، زۆر بە باشی لێ بردنەوە (یاری)؛ بۆڕپێدان؛ باش بەزاندن.
(۳) [Slang]، پەیتا پەیتا لێدان؛ بە بێ بەزەییانە دارکاری کردن یا بیرازکردن.
**shellacking** (shə-lak′iŋ), *n.* [Slang], (۱) دارکاری کردن؛ بیرازکردن؛ بە قامچی لێدان. (۲) بە تەواوی بەزاندن؛ باش بۆڕپێدان
**shell-back** (shel′bak′), *n.* (۱) کەشتیوانی قاڵ یا شارەزا.
(۲) کەسێکە کە کەمەرەی زەوی بڕیبێ بە کەشتی.
**shell-bark** (shel′bärk′), *n.* = **shagbark.**
**shell bean,** جۆرە لۆبیایەکە کە هەر ناوکەکەی دەخورێت نەك قاوغەکەی.
**shell-fire** (shel′fīr′), *n.* تۆپ پێوەنان؛ بۆمباباران (بە تۆپ).
**shell-fish** (shel′fish′), *n.* گیانداری ئاوی قاوغدار (گوێچکەماسی، قرژانگ، کوللەی دەریا...هتد).
**shell game,** پیلانێکە بۆ خەڵەتاندن و گزی لێکردن و دەستبڕینی کڕیارو سەوداگەر؛ گزی؛ دەستبڕین.
**shell jacket,** جۆرە چاکەتێکی کورت و تەسکە بۆ بۆنەی نیمچە ڕەسمی.
**shell-proof** (shel′prōōf′), *adj.* بۆمبا کارتێنەکەر؛ دژی بۆمبا.
**shell shock,** مێشك تێکچوونی سەرباز لە جەنگدا بەهۆی بۆمبابارانی

بەردەوامەوە

**-shell-shocked** *(adj.)*.

**shelly** (shel′i), *adj.* (١) بە گوێچکەماسی یا قاقلە داپۆشراو.
(٢) قاوغی؛ قاقلەیی؛ قاقلەدار.

**shelter** (shel′tēr), *n.* (١) پەناگا؛ پەنا؛ لانە؛ دالدە:
*( to take ~ ; to give ~ to somebody)*
(٢) پارێزگاری؛ پاراستن.
*v.t.* . *( to ~ someone)* دالدەدان؛ پەنادان؛ گرتنەخۆ؛ جێکردنەوە؛ پاراستن:
*v.i.* دالدە بۆ بردن؛ پەنا بۆ بردن.

**shelter tent,** چادرێکی بچکۆلەی دوو کەسییە.
(پێشی دەووترێ: " pup tent ").

**shelty, sheltie** (shel′ti), *n.* = shetland sheep dog, shetland pony.

**shelve** (shelv), *v.i.* لێژبوون؛ بەرەوخواربوونەوە.
*v.t.* (١) ڕەفە بۆ کردن؛ ڕەفە بۆ دروستکردن. (٢) خستنەسەر ڕەفە.
(٣) (ا) خستنەلاوە؛ دواخستن؛ خستنە پشت گوێ:
*( to ~ a plan, project, discussion, etc.)*
(ب) خانەنشین کردن؛ لە ئیش دەرکردن؛ لێ خستن.

**shelves** (shelvz), *n. plural of* **shelf.**

**shelving** (shel′viŋ), *n.* (١) کەرەسەی ڕەفە.
(٢) ڕەفە بەگشتی؛ ڕەفەکان.
(٣) شت خستنەسەر ڕەفە؛ ڕێکخستن لەسەر ڕەفە.
(٤) (ا) لێژگە؛ لێژایی؛ لێژی. (ب) پلەی لێژی.

**Shemite** (shem′īt), *n.* = Semite.

**Shemitic** (shem-it′ik), *adj.* = Semitic.

**shenanigan** (shi-nan′i-gən), *n.* [Colloq.]. قسەی هیچ‌وپووچ و بێ مانا؛ فێڵبازی؛ فێڵ و تەڵەکە؛ کەتن؛ تەڵەکەبازی؛ خەڵەتان؛ تەشقەڵە؛ چەوتی.

**sheol** (shē′ōl), *n.* (١) جێی مردووان (ئینجیل).
(٢) [-S]، [Colloq.]، دۆزەخ، جەهەننەم.

**shepherd** (shep′ērd), *n.* (١) شوان.
(هەروەها " sheepherder ").
(٢) ڕابەری ئاینی (مەلا، قەشە...هتد)؛ ڕابەری کڵێسە.
*v.t.* (١) شوانی کردن؛ بەدیارەوەبوونی ڕانەمەڕ.
(٢) ڕابەری کردن؛ سەرەوکاری کردن؛ چاودێری کردن؛ ئاگا لێ بوون.
**the Good Shepherd,** عیسا

**shepherd dog,** = sheep dog.

**shepherdess** (shep′ērd-is), *n.* شوانی ژن؛ کچە شوان.

**shepherd's check,** (١) ئەدەشێکی میل میلی ڕەش و سپییە.
(٢) قوماشێکی میل میلی ڕەش و سپییە.
(پێشی دەووترێ: " shepherd's plaid ").

**shepherd's purse,** گیایەکی گوڵ سپییە کەلووی سێگۆشەیی وەك دڵ دەگرێ.

**sherbet** (shūr′bət), *n.* (١) شەربەت؛ خۆشاو.
(٢) شیرینییەکە لە دۆندرمە دەچێت.

**sherd** (shūrd), *n.* = shard.

**shereef** (shə-rēf′), *n.* = sherif.

**sherif** (shə-rēf′), *n.* (١) شەریف، نەوەی پێغەمبەر.
(٢) شەریف، فەرمانڕەوای مەککە.

**sheriff** (sher′if), *n.* (١) سەرۆکی پۆلیسی سوارەی دەرەوەو ناوشار کە ئاسایشی ناوچەکەو جێبەجێکردنی فەرمانەکانی دادگای پێ سپێردراوە).
(٢) سەرۆکی شارەوانی و دادگەری ناوچەیەکی ئینگلتەرەیە.

**sherris** (sher′is), *n.* [Archaic]. = sherry.

**sherry** (sher′i), *n.* شێری (ا) شەرابێکی ئیسپانی خەستە (گەلێك جار شەربەتە). (ب) شەراب یا مەیەکی وەها.

**she's** (shēz), = she is, she has.

**Shetland pony,** ئەسپی کورتەباڵای شێتلاند: ئەسپێکی کورتەباڵای بەهێز و کلك درێژە (لە "شێتلاند"ەوە هاتووە کە دوورگەیەکی نزیك ئوسکوتلەندەیە).

**Shetland sheep dog,** سەگی شوانی شێتلاند.
(ووشەی پێشوو وە " sheep dog " ببینە).

**shew** (shō), *n., v.t. & v.i.* = show.

**shewbread** (shō′bred′), *n.* = showbread.

**Shiah, Shia** (shē′ə), *n.* (١) شیعە (ئیسلام)؛ لقی شیعە.
(٢) Shiite.

**shibboleth** (shib′ə-ləth), *n.* (١) تاقیکردنەوە (ئاینی جوولەکە).
(٢) تاقیکردنەوە (بەتایبەتی بۆ ناسینەوە و جیاکردنەوەی کەسێك).
(٣) درووشم و نیشانەیەکی تایبەتی کۆمەڵێك، تاقمێك، یا حیزبێك.

**shied** (shīd), *past tense and past participle of* **shy.**

**shield** (shēld), *n.* (١) زرێ؛ قەڵغان.
(٢) پارێزەر (مرۆڤ، شت)؛ هۆی پاراستن.
(٣) قەڵغانێکە کە درووشمی هۆزێکی پێوەیە.
(٤) شتێکی لە قەڵغان چوو.
(٥) گوللەبەند یا بەربەستێکی ئاسنی تۆپ یا تۆپ هاوێژە (بۆ پاراستنی تۆپچییەکان). (٦) پەردە یا بەربەستی پاراستن (مەکینەکاری)
(٧) بەربەستی نارەق: شتێکی هەڵمژ یا لاستیکییە لە بن قۆڵی کراس و چاکەتدا لەبەردەکرێت بۆ پاراستنی لە نارەق. (٨) قاوغ (کیسەڵ).
(٩) بەربەستی ئەتۆم: دیوارێکی قورقوشمی یا چیمەنتۆیە بەدەوری فرنی ئەتۆمیدا بۆ بەربەستکردنی تیشك (فیزیا).
*v.t.* (١) پاراستن بە زرێ. (٢) پاراستن؛ پارێزگاری کردن.
(٣) شاردنەوە؛ داپۆشین؛ بەرچاوگرتن: *( to ~ from view)*
*v.i.* بوون بە زرێ بۆ؛ پاراستن.

**shielding** (shēld′iŋ), *n.* (١) کۆختەی دەشت و شاخی شوانان.
(٢) [British Dial.]، هاوینە لەوەڕگای شاخ و کێو.

**shier** (shī′ēr), *n.* ئەسپی سرك: ئەسپێکە کە زووزوو هەڵدەسڵەمێتەوە.

**shift** (shift), *v.t.* (١) گۆڕین (لە شوێنێك، کەسێك، یا بارێکەوە بۆ یەکێکی تر)؛ گواستنەوە؛ لادان؛ خستنەسەر: *( Don't ~ the responsibility.; to ~ the blame on to someone else; to ~ the scenes)*
(٢) گۆڕینەوە؛ جێگۆڕکێ پێکردن؛ ئاڵوگۆڕکردن.
(٣) گێر گۆڕین (ئۆتۆمبیل). (٤) گۆڕینی دەنگ (زمانەوانی).
*v.i.* (١) گۆڕان (شێوە، جێ، سرووشت، ڕێباز)؛ جووڵان؛ لە ڕێ لادان.
(٢) دەربردن بەبێ یارمەتی کەس؛ هەڵ کردن؛ پشت بە خۆ بەستن؛ خۆ بەخێوکردن: *( You must ~ for yourself now.)*
(٣) سەرچەوتی کردن؛ ئۆینبازی کردن؛ فێڵبازی کردن؛ ساختەکردن.
(٤) گێر گۆڕین: *( Our new car ~s automatically.)*
(٥) [Archaic or Dial.]، جل گۆڕین؛ خۆگۆڕین.
*n.* (١) گۆڕین؛ گۆڕان: *( a ~ in foreign policy)*
(٢) (ا) پیلانی ڕزگارکردن (بەتایبەتی لە تەنگانەیەك).
(ب) فێڵ و تەڵەکە؛ فێڵبازی؛ ئاین و ئۆین؛ ساختە؛ خۆ دەربازکردن
(٣) گۆڕینەوە؛ جێگۆڕکێ کردن؛ ئاڵوگۆڕ.
(٤) نۆرە؛ نۆبە؛ نۆبەت؛ سەرە؛ شەفت.
(٥) تاقمە کرێکاری شەفتێك: تاقمە کارگەری بە یەك نۆرە ئیش کردوو؛ شەفت: *( Three members of the night ~ were absent.)*
(٦) گۆڕانی ڕووی با هەڵکردن.
(٧) [Archaic or Dial.]، جل گۆڕین؛ خۆگۆڕین.
(٨) [Rare]. chemise (٩) جێگۆڕکێی یاریکەر (فوتبۆلی ئەمەریکی)
(١٠) گێڕی ئۆتۆمبیل گۆڕین.
(١١) جووڵانی زەوی لە دەورووبەری قڵیشی گەورەی زەمیندا (زەمینناسی)
(١٢) جێی پەنجە یا دەست گۆڕین لەسەر کەمانچە و ئامێری تر
(١٣) دەنگ گۆڕین (زمانەوانی).
**make shift,** (١) دەربردن لە دۆخی ناهەموواردا؛ بە چنگەکرێ هەڵ کردن

بەبێ یارمەتی کەس.
(٢) ئەوپەڕی هەوڵدان؛ هەتا لە توانادا بێ کۆشش کردن.

**-shifter** ***(n.).***

**shiftless** (shift′lis), ***adj.*** (١) تەمەڵ؛ لەش گران.
(٢) لێ نەهاتوو؛ دەستەپاچە؛ ناکارامە.

**-shiftlessly** ***(adv.)***; **shiftlessness** ***(n.).***

**shifty** (shif′ti), ***adj.*** (١) چەوت؛ فێڵباز؛ سەرچەوت؛ ناپاك؛
پشت پێ نەبەستراو؛ بێ بار؛ هەمیشە گۆڕاو:
***( ~ eyes; a ~ character or person)***
(٢) کارامە؛ لێهاتوو؛ زۆرزان.

**-shiftily** ***(adv.)***; **shiftiness** ***(n.).***

**Shiism** (shē′iz'm), ***n.*** شیعەیەتی

**Shiite** (shē′īt), ***n.*** شیعەیەك؛ کەسێکی شیعە.

**shikar** (shi-kär′), ***n.*** ڕاو

***v.t. & v.i.*** ڕاوکردن.

**shikari; shikaree** (shi-kä′rē), ***n.*** ڕاوچی؛ ڕاوکەر؛ ڕابەر یا
چاوساغی هیندی ڕاوکەران.

**shill** (shil), ***n.*** [Slang], داو (مەجان)؛ تەڵە؛ کەسێکە کە چەرچی یا
قومارچی یا خاوەن تیاترۆو پیشانگا بەکاری دەهێنێت بە خۆپیشاندان بە
کڕیار یا سەوداگەر بۆ ڕاکێشانی خەڵکی ترو هاندانیان بۆ کڕین یا بەشداری
کردن

**shillelagh, shillalah** (shi-lā′lə, shə-lā′li), ***n.*** کوتەك؛ دار

**shilling** (shil′iŋ), ***n.*** (١) شلنگ: پارەیەکی وردەی ئینگلتەرەیە
بیست یەکی پاوەنیکە. (٢) شلنگ: پارەی هەندێك وڵاتی ئەفەریقایە وەك
کینیا

**shilly-shally** (shil′i-shal´i), ***adv.*** بە ڕاڕایی؛ بە دوودڵی

***adj.*** دوودڵ؛ ڕاڕا.

***n.*** دوودڵی (بەتایبەتی دەربارەی شتێکی هیچوپووچ)؛ ڕاڕایی.

***v.i.*** (١) دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن.
(٢) خۆ بە شتی هیچوپووچەوە خەریك کردن.

**-shilly-shallier** ***(n.).***

**shily** (shī′li), ***adv.*** = **shyly.**

**shim** (shim), ***n.*** پوازێکی دار یا ئاسنە بۆشایی پێ پڕدەکرێتەوەو شتی
پێ ڕاست دەکرێتەوە وەك کورسی و مێزی لارەسەنگ؛ ئاواخن؛ پشتیوانە.

***v.t.*** پڕکردنەوە یا ڕاستکردنەوە بە پواز؛ ئاو ئاخنین.

**shimmer** (shim′ēr), ***v.i.*** (١) درەوشانەوە؛ تروسکانەوە؛
وورشانەوە؛ بریسکەهاتن ناوبەناو. (٢) کەروێشکەکردن.

***n.*** وورشە؛ وورشە وورش؛ بریسکە؛ تروسکە؛ درەوشانەوە.

**-shimmery** ***(adj.).***

**shimmy** (shim′i), ***n.*** (١) ئەرینەوەی یا یاری کردنی پێچکەی
ئوتومبێل. (٢) شیمی: سەمایەکی جازی ئەمەریکییە بادانی زۆر تێدایە.
(٣) [Dial. or Colloq.]، **chemise**.

***v.i.*** (١) ئەرینەوە؛ لەرزین. (٢) سەمای (شیمی) کردن

**shin** (shin), ***n.*** (١) لوولاق
(٢) پارچە گۆشتی بەشی خوارووی لوولاقی پێشەوەی ڕەشەوڵاغ.

***v.t.*** (١) بە دار یا گوریسدا هەڵگەڕان بە هەردوو دەستو قاچ.
(٢) شەق لە لوولاق هەڵدان؛ شەق هەڵدان لە لوولاقە.

**shin-bone** (shin′bōn´), ***n.*** ئێسقانی لوولاق؛ لوولاقە ئێسقان.

**shindig** (shin′dig), ***n.*** (١) ئاهەنگی سەماو هەڵپەڕکێ
(٢) ئاهەنگ؛ زەماوەند

**shindy** (shin′di), ***n.*** (١) هەر وزەنا؛ هەراوهوریا؛ هەرا
(٢) **shindig**

**shine** (shīn), ***v.i.*** (١) بریقەنەوە؛ شەوقدانەوە؛ بریسکەدانەوە؛
درەوشانەوە؛ پرشنگدانەوە. ***( The Sun was ~ing.)***
(٢) دەرکەوتن (لەناو کۆمەڵدا)؛ شەوقدانەوە (مەجاز)

***( He dose not ~ in conversation.)***
(٣) زۆر باش دیاربوون؛ گەشانەوە؛ پرشنگدانەوە.

***v.t.*** (١) شەوق لێدان؛ داگیرساندن: ***( ~ your flashlight over here.)***.
(٢) بۆیاخ کردن (پێڵاو)؛ بریقە لێ هەڵسان: ***( ~ your shoes.)***.

***n.*** (١) بریقە؛ شەوق؛ ڕووناکی؛ بریسکە؛ پرشنگ؛ وورشە.
(٢) (ا) بۆیاخ کردنی پێڵاو وبریقە لێ هەڵسانی.
(ب) بریقەی پێڵاوی بۆیاخ کراو.
(٣) سایەقە؛ هەتاو: ***( rain or ~ )***.
(٤) (*pl.*) [Colloq.]، تەشقەڵە؛ پەنگ؛ تەڕن.
(٥) [Slang]، هەراوزەنا؛ هەراوهوریا. (٦) [Slang]، وێسکی

**rain or shine,** باران بێ یا سایەقە؛ باران بێ یا هەتاو؛ هەموو کات؛
هەمیشە.

**shine up to,** [Slang], خۆ لێ بردنە پێشەوە.

**take a shine to,** [Slang], یەکسەر چوونە دڵەوە؛ بەدڵ بوون؛
خۆشویستن

**shiner** (shīn′ēr), ***n.*** (١) شتی بریقاوە؛ کەسێکی دەرکەوتوو لە کۆمەڵدا.
(٢) ماسییەکی بچووکی پوولەکە زیوییە.
(٣) [Slang]، چاوشین بوونەوەو خوێن تێزان (بەهۆی مستەکۆڵە لێدانەوە)

**shingle** (shiŋ′g'l), ***n.*** (١) زیخو چەوی درشتی کەنار دەریا؛
وورده بەردی گوێ دەریا. (٢) چەوو زیخی درشت؛ وورده بەرد.
(٣) کەنار دەریای داپۆشراو بە چەوو زیخی درشتو وورده بەرد

**shingle** (shiŋ′g'l), ***n.*** (١) (ا) تەختەدارێکی بچووکە تێهەڵکێش
دەکرێو سەربانی پێ دەگیرێ (هەندێك جاریش دیواری دەرەوە)
(ب) پارچە ئەسبێستۆسی بەکارهێنراو بۆ هەمان مەبەست.
(٢) قژ تاشینی کورتی ئافرەت.
(٣) [Colloq.]، تەختەی ناوو ناونیشانی بەردەمی فەرمانگەی پزیشكو
پارێزەر...هتد: ***( to hang out a ~ )***.

***v.t.*** (١) سەربان گرتن بە تەختەداری بچووکی تێهەڵکێش کراو.
(٢) قژ زۆر کورتکردنەوە.

**hang out one's shingle,** فەرمانگە کردنەوە (پزیشك، پارێزەر).

**shingles** (shiŋ′g'lz), ***n.*** ئەخۆشییەکە دەبێتە هۆی برین لێ هاتنو
تلۆق کردنی پێست.

**shingly** (shiŋ′gli), ***adj.*** زیخاوی؛ وورده بەرداوی.

**shining** (shīn′iŋ), ***adj.*** (١) بریقەدار؛ بریسکەدار؛ شەوقدەرەوە.
(٢) گەش؛ سەرنج ڕاکێش؛ دەرکەوتوو؛ بەناوبانگ:
***( a ~ example of courage)***

**shin-leaf** (shin′lēf´), ***n.*** ڕووەکێکی لاسك درێژە گەڵای خڕ بە
بە بنەکەیەوەیەو گوڵی سپی دەگرێت.

**shinny, shinney** (shin′i), ***n.*** (١) شێوەیەکە لە یاری (هۆکی)
منداڵان. (٢) گورزی ئەم یارییە.

***v.i.*** کردنی ئەم یارییە.

**shinny** (shin′i), ***v.i.*** [Colloq.], **( ~ up ),** هەڵگەڕان بە دارو پەتدا
بە هەردوو دەستو قاچ

**shin-plaster** (shin′plas´tēr, shin′pläs´tēr), ***n.*** (١) مشەمای
لە پێست گرتن. (٢) پارەی کاغەزی بێ نرخ.

**shiny** (shīn′i), ***adj.*** (١) بریقەدار؛ بریسکەدار؛ بریقاوە.
(٢) سافو لووس. (٣) ڕووناك؛ هەتاو؛ سایەقە.

**-shininess** ***(n.).***

**ship** (ship), ***n.*** (١) کەشتی گەورە؛ کەشتی؛ پاپۆڕ
(٢) کەشتی بایەوان؛ کەشتی چارۆکەدار.
(٣) کەشتیوانو ئەفسەری کەشتییەك. (٤) فرۆکە

***v.t.*** (١) بارکردنە سەر کەشتی؛ هێنان یا خستنەسەر پاپۆڕ.
(٢) ناردن یا گواستنەوە (بەهەر هۆیەکی گواستنەوە بێت):
***( We ~ped the cattle by rail.)***
(٣) ئاوتێچوونی کەشتی (لە زریاندا).

(٤) خستنە شوێنی خۆی لەسەر کەشتی: *(~ the oars.)*
(٥) بە کرێ گرتن بۆ ئیش کردن لەسەر کەشتی
(٦) [Colloq.]، دوورخستنەوە؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ خۆ لێ رزگارکردن.
*v.i.* (١) سواری کەشتی بوون؛ دەست بە گەشتی دەریا کردن؛ گەشتکردن بە کەشتی (٢) ئیش کردن لەسەر کەشتی؛ بەکرێ گیران بۆ ئیشی سەر کەشتی
**when one's ship comes home (or in),** کاتێ دەوڵەمەندبوونی کەسێک کە ئاوات جێبەجێ دەبێت؛ کاتێ بە ئامانج گەیشتن.
**-ship** (ship), پاشگرێکە بەمانای: (ا) بار؛ دۆخ؛ چۆنێتی: ***(friendship)***
(ب) پلەوپایە: ***(professorship; kingship)***
(ج) کەسێکی خاوەن ئەم پلەوپایەیە: ***(lordship)***
(د) کارامەیی؛ توانا؛ لێزانین: ***(penmanship; leadership)***
**ship biscuit,** = hardtack.
**shipboard** (ship′bôrd´, ship′bōrd´), ***n.*** (١) کەشتی؛ پاپۆر. (٢) [Obs.]. لاتەنیشتی کەشتی.
**on shipboard,** لەناو کەشتیدا؛ لەسەر پاپۆر.
**shipbuilder** (ship′bil´dẽr), ***n.*** وەستای کەشتی؛ کەشتی دروستکەر.
**ship-building** (ship′bil′diŋ), ***n.*** کەشتی دروستکردن.
***adj.*** هی کەشتی دروستکردن.
**ship canal,** جۆگەی کەشتی پێدا ڕۆیشتن.
**ship chandler,** بازرگانی کەرەسەو شتومەکی کەشتی.
**ship-load** (ship′lōd´), ***n.*** باری تەواوی کەشتی؛ پڕ کەشتییەک.
**shipman** (ship′mən), ***n.*** (١) کەشتیوان (٢) **shipmaster**
**shipmaster** (ship′mas´tẽr, ship′mäs´tẽr), ***n.*** ڕانەری کەشتی؛ کەشتی ڕانەر؛ ناخۆدای کەشتی؛ سەرۆکی کەشتی.
**ship-mate** (ship′māt´), ***n.*** هاوکەشتیوان؛ ئاوەڵ کەشتییەوان.
**shipment** (ship′mənt), ***n.*** (١) شتومەک گواستنەوە؛ شتومەک ناردن (بە هۆیەکی هاتوچۆدا)؛ بار ناردن (٢) بارگە، بار؛ باری گوێزراوە
**ship money,** باجی کەشتی. باجێکی کۆنی ئینگلیزی بوو لەسەر بەندەرەکانی ئینگلتەرە بۆ پارە کۆکردنەوە بۆ دروستکردنی کەشتی جەنگ (دەمێکە لابراوە).
**ship of the line,** کەشتی جەنگی گەورە.
**ship-owner** (ship′ōn´ẽr), ***n.*** خاوەن کەشتی.
**shippable** (ship′ə-b'l), ***adj.*** دەتوانرێ بنێررێت یا بگوێزرێتەوە
**shipper** (ship′ẽr), ***n.*** بارگەنێر: خاوەنی بارگەکە خۆی یا بریکارەکەی؛ کارگێری بارگە ناردن
**shipping** (ship′iŋ), ***n.*** (١) بارگە ناردن یا گواستنەوە؛ ناردن یا گوێزانەوەی شتومەک. (٢) کەشتی گەلێ وڵاتێک یا بەندەرێک (بەتایبەتی لەڕووی ئەو بارەوە کە دەتوانن هەڵی بگرن). (٣) [Obs.]. کەشتی دەریایی
**shipping clerk,** فەرمانبەری بارگە ناردن؛ کارگەری بار ناردن.
**shipping room,** ژووری بارگە کردن و ناردن (لە کارگەیەک یا دەزگایەکدا)
**ship-shape** (ship′shāp´), ***adj.*** ڕێکوپێک؛ پاک‌وتەمیز.
***adv.*** بە ڕێکوپێکی؛ بە پاک‌وتەمیزی؛ بە جوانی.
**ship's papers,** بەڵگەنامەی کەشتی
**ship-way** (ship′wā´), ***n.*** (١) چوارچێوەی کەشتی لەسەر دروستکردن (٢) **ship canal**
**ship-worm** (ship′wũrm´), ***n.*** کرمی کەشتی. گیاندارێکی کرم ئاسایی قاقلەدارە داری ژێر ئاو دەخواتەوەو زیانی پێ دەگەیێنێت (وەک هی بەلەم و کەشتی).

**ship-wreck** (ship′rek´), ***n.*** (١) لاشەی کەشتی نوقوم بوو یا وەرگەڕاو. (٢) کەشتی وەرگەڕان؛ کەشتی شکان؛ کەشتی نوقوم بوون. (٣) ژێرکەوتن؛ تێکشکان؛ شکستی؛ ماڵ وێرانی؛ فەوتان.
***v.t.*** (١) کەشتی وەرگەڕاندن، شکاندن، یا نوقوم بوون. (٢) ژێرخستن؛ تێکشکاندن؛ ماڵ وێران کردن؛ فەوتاندن.
**ship-wright** (ship′rīt´), ***n.*** وەستای کەشتی؛ کەشتی چاککەرەوە
**ship-yard** (ship′yärd´), ***n.*** شوێنی کەشتی دروستکردن و چاک کردنەوە.
**shire** (shīr), ***n.*** (١) ناوچە (ئینگلتەرە)؛ هەرێم. (٢) ناوچەیەک یا هەرێمێکی ئینگلیزی.
**shire horse,** بارگیری ئینگلیزی.
**shirk** (shũrk), ***v.t.*** خۆدزینەوە لە ئەرکی سەرشان؛ ئەرکی سەرشان فەرامۆش کردن یا بەجێ نەهێنان: ***(to ~ one's duty or responsibility)***
***v.i.*** خۆدزینەوە لە ئەرکی سەرشان.
***n.*** کەسێکە کە خۆی بدزێتەوە لە ئەرکی سەرشان و جێبەجێی نەکات.
**shirr** (shũr), ***v.t.*** (١) لۆچ کردن و تێک کردنی قوماش بە ڕیز (بۆ ڕازاندنەوەی). (٢) هێلکە برژاندن (بەبێ توێکڵەکەی).
***n.*** چەند لۆچێکی هاوڕێکی تێک کراوی کاڵا.
**shirring** (shũr′iŋ), ***n.*** = **shir.**
**shirt** (shũrt), ***n.*** (١) کراس. (٢) **shirtwaist** (٣) **undershirt**.
**keep one's shirt on,** [Slang], بە هێمنی مانەوە؛ خۆ تێک نەدان.
**lose one's shirt,** [Slang], لەکیس چوونی هەمووشت؛ دانانی هەموو سامان: ***(He lost his shirt on that business deal.)***
**shirting** (shũr′tiŋ), ***n.*** قوماشی کراس.
**shirt-sleeve** (shũrt′slēv´), ***adj.*** (١) خاکی؛ سادە؛ ساکار. (٢) خۆماڵی؛ سەرەتایی؛ ڕەشۆکی؛ سادە: ***(~ philosophy)***
**shirt-waist** (shũrt′wāst´), ***n.*** کراسی تا ئاوقەد هاتووی ژنانە (لەگەڵ تەنوورە لەبەردەکرێت).
**shish-kebab,** گۆشتی برژاو؛ کەباب.
**shit** (shit), ***v.i.*** [Vulgar], گووکردن؛ پیسایی کردن.
***v.t.*** [Vulgar], خەڵەتاندن؛ لەخشتەبردن؛ فێڵ لێکردن.
***n.*** [Vulgar], (١) گوو؛ پیسایی. (٢) گووکردن؛ پیسایی کردن. (٣) شتی بێ نرخ؛ شتی هیچ‌وپووچ و بێ فەڕ. (٤) [Slang]، قسەی قۆڕ؛ قسەی هیچ‌وپووچ. (٥) [Slang]، کەسێکی هیچ‌وپووچ و بێ نرخ. (٦) [Slang]، هێرووین؛ بەنگ.
***interj.*** [Vulgar Slang], گووی تێ بێ!؛ بە زیاد نەبێ!؛ بە زیادم نەکرد!.
**shittah** (shit′ə), ***n. Also* shittah tree,** دارچەوی.
**shittim** (shit′im), ***n. Also* shittim wood,** دارو تەختەی دارچەوی.
**shivaree** (shiv´ə-rē′), ***n. Also* charivari,** زەماوەندی مۆسیقای لاسایی: بریتییە لە زوڕنالێدان و تەقەتەق کردن بە کتلی و مەنجەڵ لەبەردەم لەبەردەم ژووری بووک و زاوادا.
**shive** (shīv), ***n.*** (١) تەڵەزم. (٢) کۆزەر. (٣) تەپەدۆرێکە بارێک بێت بۆ دەمی شووشەکە.
**shiver** (shiv′ẽr), ***n.*** پارچە شووشەی شکاو؛ تەڵەزم.
***v.t. & v.i.*** وردوخاش بوون؛ پارچە پارچە بوون.
**shiver** (shiv′ẽr), ***v.i.*** لەرزین؛ هەڵلەرزین؛ گیان لەرزین؛ لرفەلرف هاتن.
***v.t.*** شەکاندنەوەی بایەوان (بە ڕووی کردنە با).
***n.*** لەرزین؛ لرفە؛ لرفەلرف؛ تەزوو؛ موچڕک.
**shivery** (shiv′ẽr-i), ***adj.*** قرچۆک؛ بە ئاسانی دەشکێت و وردوخاش دەبێت.
**shivery** (shiv′ẽr-i), ***adj.*** (١) لەرزیو؛ هەڵ لەرزیو.

(٢) لەرزێنەر؛ سارد؛ ترسناك؛ ترسێنەر.
**shoal** (shōl), *n.* (١) گەلە؛ ڕەوە؛ پۆل.
(٢) گەلەماسی؛ ماسی گەل؛ پۆلە ماسی.
*v.i.* کۆمەڵ بوون؛ مۆل خواردن؛ گردبوونەوە.
**shoal** (shōl), *n.* (١) تەنکاو (ڕووبار، دەریا، دەریاچە)؛ تەنکایی.
(٢) بستو یا بەرزایی ناو ئاو (کە باش نابینرێ و دەبێتە هۆی مەترسی بۆ بەلەم و کەشتی). (٣) مەترسی و گەندوکۆسپی شاراوە.
*v.i.* بوون بە تەنکاو؛ تەنکایی پێکهێنان.
*v.t.* (١) تەنکاوکردن
(٢) بەرەو تەنکاو ڕۆیشتن (کەشتی)؛ لە تەنکایی نزیکبوونەوە.
**shoat** (shōt), *n. Also* shote, پەلخ؛ بەچکە بەرازی تازە لە شیر براوە.
**shock** (shok), *n.* (١) لێدان؛ بەیەکداکێشان؛ بەیەکدادان
(٢) (ا) ڕاتەکان؛ ڕاوەشان: *( the ~ of an earthquake)*.
(ب) ئەنجامی ئەم ڕاتەکانە.
(٣) (ا) ڕاتەکانی مێشك؛ پشێوی مێشك لە ئەنجامی لێدانێك یا ڕاوەشاندنێك؛ مێشك شڵەقان. (ب) هۆی ئەم ڕاتەکانە.
(٤) ڕاتەکاسی کارەبایی: *( to get an electric ~ )*.
(٥) (ا) دڵەخورپێ؛ خورپە؛ ڕاچڵەکین؛ ڕاچڵەکان؛ دڵ داخورپان؛ کسپەی دڵ؛ ووڕی. (ب) هۆی ئەم دڵەخورپێیە یا ڕاچڵەکانە.
(٦) داخرانی دەماری خوێنبەر بۆ لەش بەهۆی مەیینی خوێنەوە.
*v.t.* (١) ڕاتەکاندن؛ ڕاوەشاندن؛ لەپڕو بە توند لێدان.
(٢) دڵ داخورپاندن؛ ووڕکردن؛ ووشکبوون؛ زۆر پەستکردن؛ قێز لێ هاتنەوە؛ کسپە هێنان بە دڵدا: *( He ~ed us all by his horrible behavior.)*.
(٣) تەزووی کارەبایی لێدان؛ ڕاتەکاندن بە تەزووی کارەبا.
*v.i.* [Archaic or Poetic], بە توند بەیەکدادان.
**shock** (shok), *n.* مەلۆ؛ گورزە؛ شارا.
*v.t. & v.i.* مەلۆکردن؛ گورزەکردن.
**shock** (shok), *n.* (١) تۆپەڵێکی بڕو چڕو ئاڵۆسکاو (قژ، تووك).
(٢) سەگی تیسکن
*adj.* بڕو چڕو ئاڵۆسکاو (قژ).
**shocker** (shok'ēr), *n.* شتێکی دڵ داخورپێنەر (بەتایبەتی چیرۆکێکی ووروژێنەر).
**shocking** (shok'iŋ), *adj.* (١) دڵ داخورپێن؛ هەست ڕاتەکێن؛ زۆر ناخۆش: *( the ~ news of his death)*.
(٢) زۆر ناپەسەند؛ زۆر خراپ؛ پیس و بۆگەن؛ زۆر نابەجێ و ناشرین:
*( ~ behavior)*
(٣) زەق *( ~ pink)*.
**shock tactics,** (١) هێرشی لەپڕو بەزەبرو ووڕکەر (سوپا).
(٢) کاری لەپڕو توندوتیژ.
**shock therapy,** چارەکردن بە دڵ داخورپان یا ڕاتەکاندن (بەهۆی ڕاتەکانی کارەبایی یا دەرمانەوە). (پزیشکەوانی دەروون).
(هەروەها پێشی دەوترێ: " shock treatment ").
**shock troops,** سەربازی هێرشی لەپڕ.
**shock wave,** شەپۆلی پاڵەپەستۆیی یا ڕاتەکێن: (ا) تەقینەوە.
(ب) ڕاتەکانێکە بەهۆی گۆڕانی پەستاوتنی هەواوە.
(ج) ڕاتەکانی توندوتیژ؛ ڕاوەشانی بەزەبر (مەجاز): *( ~s of rebellion)*.
**shod** (shod), *past tense and past participle of* shoe.
*adj.* (١) پێڵاو لەپێ؛ پێڵاودار. (٢) تایەی لەژێردایە؛ تایەدار.
(٣) نال کراو.
**shoddy** (shod'i), *n.* (١) (ا) ڕیسی گەندە خوری (کە لە ڕیشاڵ و کاڵاو فەرشی کۆن دەکرێت). (ب) تەنراوی خوری گەندی لەم ڕیسە دروستکراو.
(٢) شتوومەکی هەرزانبەها؛ گەندە شت؛ شتی جەڵەبی.
*adj.* (١) گەند؛ جەڵەبی؛ قەڵب؛ لە شتی گەندو کۆنە دروستکراو؛ هەرزانبەها؛ ڕەشۆکی. (٢) بە پەلەو لامسەرلایی کراو؛ قەڵب (کاڵ)؛ خراپ؛ ناکارامە (کاڵ):
*( ~ construction, worksmanship, etc.)*

(٣) پەرپووت؛ ڕووخاو.
-shoddily *(adv.)*; shoddiness *(n.)*.
**shoe** (shōō), *n.* (١) پێڵاو؛ کەوش؛ قۆندەرە؛ کلاش. (٢) نال.
(٣) شتێکە کە ئەرکی پێڵاو یا نال ببینێ و لەیان بچێ:
(ا) نالی سەری داردەست. (ب) کەوشی ئیستۆپ (ئۆتۆمبیل).
(ج) بنی پایەو پاڵپشتی تر. (د) پێستە یا دەرەوەی تایە؛ تایە.
(ە) کەوشی گالیسکە بەفرینە.
*v.t.* (١) پێڵاو بۆ کردن؛ کەوش بۆ کردن.
(٢) نال کردن: *( to ~ a horse)*.
(٣) داپۆشین (بۆ پاراستن یا جوانی)؛ بن گرتن؛ دەورەگرتن.
be in another man's shoes, لە جێی یەکتر بوون؛ لە باتی کەسێکی تر بوون:
*( If I were in your shoes, I would keep quiet.)*
fill one's shoes, جێگە گرتنەوە:
*( no one can fill his shoes.)*
the shoes is on the other foot, شتەکە یا بارەکە بە تەواوی بەپێچەوانەی ئەوی ترە.
where the shoe pinches, ئەو شوێنەی پێڵاو دەیگرێ. واتە: سەرچاوەی ئێش و ئازارو ناخۆشی و دەردی سەری.
**shoe-bill** (shōō'bil'), *n.* باڵندەیەکی ناوی دەنووك پانە لە حاجی لەقلەق دەچێت.
**shoe-black** (shōō'blak'), *n.* بۆیاخچی (پێڵاو).
**shoe-horn** (shōō'hôrn'), *n.* پاژنەهەڵکێش؛ پاژنەکێش؛ کەرەتە.
**shoe-lace** (shōō'lās'), *n.* قەیتانی قۆندەرە؛ بەنی پێڵاو.
**shoe-maker** (shōō'mākēr), *n.* پێڵاودروو؛ کەوشدروو؛ قۆندەرەچی.
-shoe-making *(n.)*.
**shoer** (shōō'ēr), *n.* نالبەند.
**shoeshine** (shōō'shīn'), *n.* (١) بۆیاخ کردن (پێڵاو).
(٢) بریقەی پێڵاوی بۆیاخ کراو. (٣) shoeblack.
**shoestring** (shōō'striŋ'), *n.* (١) پارەیەکی کەم؛ سەرمایەیەکی کەم. (٢) shoelace.
*adj.* وەك قەیتان براوە یا کراوە؛ باریك و درێژ؛ قەیتانی: *( ~ potatoes)*.
on a shoestring, بە پارەیەکی زۆر کەم؛ بە سەرمایەیەکی کەم:
*( The company started on a shoestring.)*
**shoetree** (shōō'trē'), *n.* قالبی پێڵاو (بۆ ڕاستکردنەوەی).
**shofar** (shō'fär, shō'fēr), *n. Also* shophar, کەڵەشاخی بەران.
**shogun** (shō'gōōn', shō'gun'), *n.* فەرمانداری زۆر بەدەسەڵاتی یابانی کۆن.
**shogunate** (shō'gōōn-āt', shō'gun-it), *n.* (١) پلەوپایەو دەسەڵاتی "شۆگەن" (ووشەی پێشوو ببینە). (٢) "شۆگەن" نشین.
**shone** (shōn), *alternative past tense and p.p. of* shine.
**shoo** (shōō), *interj.* (١) کشە! (بۆ مریشك و پشیلە دەرکردن)؛ کش! ختە! خت. (٢) لاچۆ! بچۆرە دەرەوە! لاچۆ لێرە!.
*v.i. & v.t.* کشەلێکردن؛ کش لێکردن؛ دەرکردن.
**shoo-in** (shōō'in'), *n.* [Colloq.], پێشبڕکێکەرێك یا نامزەدکراوێکە کە بردنەوەی مسۆگەر بێت: *( a ~ candidate)*.
**shook** (shook), *n.* (١) کەرەسە یا پارچەکانی پێکەوەنانی سنووق و بەرمیل...هتد. (٢) مەلۆ؛ گورزە؛ شارا.
**shook** (shook), *past tense of* shake.
**shook-up** (shook'əp'), *adj.* [Slang], شڵەژاو؛ پەشۆکاو؛ پەشێواو.
**shoon** (shōōn), *n.pl.* [Archaic or Dial], *plural of* shoe.
**shoot** (shōōt), *v.t.* (١) خێرا پێدا ڕۆیشتن یا برین:
*( He ~s the rapids in his canoe.)*
(٢) هەڵزشتن (وەك بۆ ناو بۆری یا جۆگەیەکی لێژ).

(٣) هاویشتن (لەنگەر، تۆڕەماسی)؛ فڕێدان؛ هەڵدان.
(٤) هێنان و بردن (کێلوون یا سوورگی دەرگا).
(٥) ڕەنگێکی تر لێدان یا پیاهێنان و ڕەنگ گۆڕین.
(٦) تەرز فڕێدان؛ چووزکردن؛ چووز هاویشتن.
(٧) (ا) هاویشتن (تیر، مووشەك)؛ هەڵدان؛ تەقاندن (گوللە، فیشەکەشێتە)؛ تێگرتن. (ب) هاویشتن (تیشك)؛ دانەوە (تیشك)؛ هاوێژان.
(٨) تێگرتن (پرسیار)؛ لێ کردن؛ بەسەردا داباراندن (پرسیار):
*( They were ~ing questions at him.)*
(٩) تەقەکردن؛ تەقاندن (تفەنگ، دەمانچە...هتد)؛ پێوەنان (تیر، گوللە)؛ ئاگردان: *( to ~ a gun, pistol, rocket, etc.)* .
(١٠) کوشتن (بە گوللە، مووشەك... هتد)؛ برینداركردن؛ پێکان؛ لێدان:
*( He shot her dead.)*
(١١) ڕاوکردن (لە ناوچەیەك یا پەڵەیەك زەوی تایبەتیدا).
(١٢) بەرزی ئەستێرە پێوان: *( to ~ a star)* .
(١٣) وێنەگرتن (بە کامێرای فیلم گرتن) *( to ~ a picture, film, etc.)* .
(١٤) [Slang]، پێدان؛ دانەدەست (لەسەر مێزی نانخواردن)؛ ناردن:
*( ~ the salt to me.)*
(١٥) (ا) هاویشتن بەرەو گۆڵ (تۆپی باسکەو بالە)؛ هەڵدان؛ فڕێدان.
(ب) خاڵ گرتن؛ ئەوەندە خاڵ گرتن؛ بردنەوە
(ج) تیل کردن (هەڵماتێن).
(د) یاری کردن (بلیارد، گۆڵف) *( to ~ pool)* .

***v.i.*** (١) لەپڕ دەرچوون (تیر)؛ بە تیژی ڕۆیشتن؛ تێ تەقان.
(٢) بە توندوتیژی و لەپڕ هەستپێکران (ئێش وئازار، گەرمی).
(٣) سەردەرهێنان (لووتکە).
(٤) تەرز فڕێدان؛ لەپڕو زۆر چووز هاویشتن.
(٥) تفەنگ تەقاندن.
(٦) تەقین: *( The gun won't ~ until it is cocked.)* .
(٧) (ا) وێنەگرتن (هی دیمەنێك بە کامێرا).
(ب) دەست بە فیلم گرتن کردن؛ کامێراکە ئیش پێکردن بۆ فیلم گرتن.
(٨) ڕاوکردن (بە تفەنگ): *( He fishes but he dosen't ~ .)* .
(٩) (ا) تۆپ هەڵدان بەرەو باسکە یا گۆڵ.
(ب) یاری کردن (بلیارد، گۆڵف):
*( He has been ~ing poorly for some time.)*
(١٠) کشان (ئەستێرە).

***n.*** (١) ڕاو؛ ڕاوە گەشت. (٢) ڕووان؛ چەکەرەکردن؛ گەورەبوون.
(٣) جەکەرە؛ تەرز؛ چووز؛ گەڵاو خەڵفی تازە؛ گۆپکە (٤) وەچە؛ وەچ.
(٥) خوڕاو؛ ڕێژاو؛ قەڵبەزە
(٦) پلووسك؛ بۆری یا جۆگەی ئەختێك لێژ (بۆ پیا ناردن و گواستنەوەی شت).
(٧) تەزوو (ئێش وئازار)؛ مووچرك؛ ئازاری وەك بە دەرزی ئاژنینەوە.
(٨) ماوەی نێوان سەول لێدان.

***interj.*** [Slang], (١) ووشەیەکە بەمانای: فەرموو چی دەڵێی بیڵێ ئامادەم گوێت لێ بگرم. (٢) ووتەیەکە بریتی جوانە بۆ "shit" وە بێزاری و نارەزایی دەردەبڕێ

**shoot at (or for),** هەول بۆ دان.
**shoot down,** خستنەخوارەوە (بە تەقە یا فرۆکەشکێن):
*( to shoot down a plane)*
**shoot for (or at),** هەول بۆ دان.
**shoot it out,** شەڕە دەمانچە یا تفەنگ کردن هەتا بەزین یا کوشتن.
**shoot off one's (or at the) mouth,** [Slang], دەم دراوی کردن؛ زمان نەوەستان؛ دەم نەوەستان.
**shoot up,** (١) زۆر زوو بالاکردن؛ بالا زیادکردن خێرا.
*( Their son shot up in no time.)*
(٢) زۆر تەقە (لێ) کردن
(٣) [Colloq.]، تۆقاندنی خەڵك یا شار بە تەقەکردن بە هەموولایەکدا.
(٤) [Slang]، شرینقەی بەنگ لێدان
**shoot through with,** پڕە لە.

**shooter** (shoot′ēr), ***n.*** (١) تەقەکەر؛ تیرهاوێژ.
(٢) (ا) هەڵمات.
(ب) دەمانچەی چەند گوللەخۆر: *( a six ~ )* .

**shooting gallery,** مەیانی سەرگیراوی نیشانچێتی؛ تەقەخانە؛ جێی تەقەکردن.

**shooting iron,** [Slang], چەکی ئاگرین.

**shooting star,** (١) ئەستێرەی کشاو.
(٢) ڕووەکێکی گەڵا لاکێشی گوڵ سپی و سوورە.

**shop** (shop), ***n.*** (١) دووکان؛ فرۆشگا؛ کۆگا.
(٢) کارگە؛ کارخانە؛ دووکانی پیشەگەری:
*( a carpenter ~ ; a machine ~ )*
(٣) دەزگای پیشەسازی یا بازرگانی: *( to set up ~ )* .
(٤) (ا) ژووری پیشەسازی لە قوتابخانەیەکدا؛ پۆلی پیشەگەری.
(ب) ڕشتەی پیشەسازی؛ هونەری پیشەگەری.

***v.i.*** (١) شت کڕین لە بازاڕ؛ شت کڕین:
*( We were ~ing in the mall yesterday.)*
(٢) بۆ شت گەڕان و کڕین: *( to ~ for a house, car, etc.)* .

**set up shop,** (١) دووکان دانان؛ دووکانی پیشەسازی یا بازرگانی کردنەوە؛ دەست بە کاسبی کردن. (٢) خۆ دامەزراندن و دەست بە کارکردن.
**shut up shop,** (١) دووکان هەڵگرتن (بۆ شەو)؛ دووکان داخستن.
(٢) دووکان داخستن (بە هەمیشەیی یا بە تەواوی)؛ دەست لە ئیش یا کاسبی هەڵگرتن (بە تەواوی).
**talk shop,** باسی پیشەی خۆ کردن.

**shophar** (shō′fär, shō′fēr), ***n.*** = **shofar.**

**shop-keeper** (shop′kēp′ēr), ***n.*** دووکاندار؛ خاوەن فرۆشگا؛ ووردەفرۆش.

**shop-lifter** (shop′lif′tēr), ***n.*** دووکان دز؛ دووکان بڕ؛ کەسێکە کە شت دەدزێ لە فرۆشگا لەکاتی یا بە ناوی شت کڕینەوە (ئەمە لە فرۆشگای ڕێژاوایدا دەبێ کە شتومەك بە ئاشکرا پیشان دراوەو لەبەردەستی کڕیاردان).

**shop-lifting** (shop′lif′tiŋ), ***n.*** دووکان دزین (ووشەی پێشوو ببینە).

**shopman** (shop′mən), ***n.*** (١) **shopkeeper** .
(٢) کارگەری فرۆشگا.

**shopper** (shop′ēr), ***n.*** (١) کڕیار؛ ئەوانەی دەچنە بازاڕ.
(٢) کڕیار بۆ خەڵك؛ کەسێکی بە کرێ گیراوە بۆ شت کڕین بۆ خەڵك
(٣) کڕیاری بەراووردکەر: کارگەرێکە فرۆشگایەك بە کرێی دەگرێ بۆ بەراووردکردنی نرخی شتومەکی فرۆشگا هاوچاوەکانی.

**shopping** (shop′iŋ), ***n.*** شت کڕین لە بازاڕ؛ چوونە بازاڕ.

**shopping center,** بازاڕ؛ تاقمە فرۆشگایەکی جۆراوجۆرە لە هەمان ناوچەدا. (پێشی دەووترێ: " **shopping plaza** ").

**shop steward,** نوێنەری یەکێتی کرێکارانی کارگەیەك یا دەزگایەك.

**shop-talk** (shop′tôk′), ***n.*** (١) زاراوەو زمانی تایبەتی پیشەیەك.
(٢) دەمەتەقێ یا گفتوگۆی دەربارەی پیشەوکارو کاسبی خۆ

**shop-worn** (shop′wôrn′, shop′wōrn′), ***n.*** پیس وچرچ ولۆچ بووەو ڕەنگەکەی چووەتەوە بەهۆی هەڵواسینەوە لە جامخانەی فرۆشگادا

**shore** (shôr, shōr), ***n.*** (١) گوێ دەریا؛ کەنار دەریا. (٢) ووشکانی.
**in shore,** نزیك کەنار دەریا؛ لەناو ئاودا بەڵام بەرەو گوێ دەریا.
**off shore,** (١) لەناو ئاودا بەڵام نزیك گوێ دەریا؛ لەولای قەراغ دەریاوە:
*( off-shore oil drilling)*
(٢) نزیك کەنار دەریا.
**on shore,** لەسەر ووشکانی؛ لەسەر قەراغ دەریا.

**shore** (shôr, shōr), ***n.*** پاڵپشت (بەتایبەتی هی بەلەم و کەشتی دەرەوەی ئاو)؛ کۆڵەکە.

***v.t.* ( ~ up),** (۱) کۆڵەکە دانەبەر.
(۲) پاڵپشتی کردن؛ یارمەتیدان: ***( to ~ up a country's economy)*** .
**shore** (shôr, shōr), *archaic past tense and p.p. of* shear.
**shore bird,** باڵندەی کەنار دەریا.
**shore dinner,** شێوی کەنار دەریا: ژەمە خواردنێکە لە ماسی و گیانداری دەریایی تازە گیراو پێکهاتبێ.
**shore leave,** پشووی ووشکانی یا کەنار دەریا: ڕێ پێدانی کەشتیوانانە بۆ چوونە ناوشار بۆ پشوو.
**shore-less** (shôr′lis, shōr′lis), ***adj.*** [Poetic], بێ پایار؛ بێ سنوور
**shore line,** سنووری دەریا و دەریاچەو ڕووبار: هێڵی قەراغ ئاو.
**shore patrol,** پاسەوانی کەنار دەریا (کە بەشێکە لە هێزی پاسەوانی کەناری دەریا)
**shore-ward** (shôr′wẽrd, shōr′wẽrd), ***adv.*** بەرەو کەنار دەریا.
***adj.*** بەرەو کەنار دەریا چوو.
**shoring** (shôr′iŋ, shōr′iŋ), ***n.*** (۱) کۆڵەکە دانەبەر؛ پاڵپشت یا دار دانە بەر. (۲) پاڵپشتی کردن؛ شێوەی پاڵپشتی.
**shorn** (shôrn, shōrn), *alternative past participie of* shear.
**short** (shôrt), ***adj.*** (۱) کورت؛ کوڵ
(۲) نزم: کورتە بنە: کورت (بەرزی)؛ گوڵ.
(۳) کورت (کات)؛ کەم (کات).
(٤) کورت (یاد، بیر)؛ بیر کورت: ***( a ~ memory )*** .
(٥) کورت (چیرۆك؛ ووتار).
(٦) (ا) کورت(وەڵام). (ب) قسەڕەق (لەبەر کورتی)؛ سەرگەرم؛ تەنگەجیکڵانە.
(۷) ناتەواو؛ کەم؛ کەمتر لە پێویست؛ کەم یا کورت دەهێنێ؛ کورت:
***( We are ~ ten dollars. ; a ~ measure)***
(۸) ئاگ تە جێی خۆی؛ نەگەیشتوو؛ کورت؛ نزیك:
***( He fired a shot that fell ~ .)***
(۹) قرچۆك؛ ئاسك؛ بە ئاسانی ووردوخاش دەبێ یا دەپرووێ.
(۱۰) (ا) لەکاتی سەوداگەرییەکەو فرۆشتنەکەدا شتەکەی نییە بەڵام چاوەڕێی دەکات. (ب) تایبەتی بەم جۆرە فرۆشتن و سەوداگەری و پارەبازییە.
(۱۱) (ا) کورت (بڕگە) (دەنگناسی، هەڵبەست).
(ب) هێزی لەسەر نییە (بڕگە) (هۆنراوە)
***n.*** (۱) شتێکی کورت، بەتایبەتی: (ا) بڕگەیەك یا دەنگێکی کورت (لە تەنیشت یەکێکی درێژەوە). (ب) فیلمێکی کورت.
(ج) ماسی بچووك (کە بەپێی یاسا نابێ ڕاو بکرێت).
(د) گوللەیەکی کورت هێناو یا نەگەیشتووە نیشان.
(۲) (ا) فرۆشیارێکە کە شتێك دەفرۆشێت بێ ئەوەی شتەکەی ببێت لە عەماردا بە هیوای قازانج کردن لە نرخ داشکان.
(ب) شتێکی بەم جۆرە فرۆشراو؛ سەوداگەرییەکی وەها.
(۳) ( *pl* ) (ا) پانتۆڵی کورتی تا سەر ئەژنۆ
(ب) پانتۆڵی کورتی وەرزش و یاری. (ج) دەرپێی کورتی پیاوانە.
(٤) ( *pl* ) پاشماوە (لە ئەنجامی شت درووستکردندا)؛ زبڵ؛ سەرکۆزەر.
(٥) short circuit . (٦) short-stop .
***adv.*** (۱) لەپڕ؛ کوتوپڕ. (۲) بە قسەی ڕەق؛ بە ناشرینانە.
(۳) بە کورتی (٤) کورتتر لەوەی پێویستە؛ بە جۆرێك کە کورت بهێنێ:
***( He cut the board off too ~ .)***
(٥) ئەختێکی مابوو؛ ئەوەندەی نەمابوو:
***( We were stopped just ~ of disaster.)***
(٦) بەبێ ئەوەی ئەو شتەی هەبێ لە عەماردا کە دەیفرۆشێ.
**fall (or come) short,** کەم بوون؛ کورت هێنان؛ کەم هێنان؛ بەس نەبوون.
**for short,** بۆ کورتی (زمانەوانی)؛ بۆ مەبەستی کورتکردنەوە.
**in short,** بە کورتی؛ بە کورتییەکەی؛ کە درێژەی پێ نەدەین.
**in short order,** خێرا؛ دەستوبرد؛ زوو؛ یەکسەر
**run short,** لێ بڕان؛ بەش نەکردن؛ بەس نەبوون
***( Our supplies ran short.; We ran short of oil.)***
**short for,** شێوەیەکی کورتە بۆ (زمانەوانی).
***( Benjamin called "Ben" for short.)***
**short of,** (۱) کەمتر لە؛ کورتتر لە
***( something short of a mile)***
(۲) لێ بڕان؛ بەش نەکردن؛ پەککەوتن لەسەر؛ بەس نەبوون:
***( to be short of money, supplies, breath, etc.)***
(۳) کەم هێنان؛ کورت هێنان؛ نەگەیشتن (ئامانج، نیشان):
***( We are still a mile short of our destination.)***
**short on,** [Colloq.], کەم هەبوون؛ نەبوون؛ بێ.
**shortage** (shôr′tij), ***n.*** کەمی؛ ناتەواوی؛ بەش نەکردن؛ کەم هێنان:
***( a ~ of rice; food ~s )***
**shortbread** (shôrt′bred′), ***n.*** بسکویتێکی ئاسکە زوو هەڵدەپرووێ.
**shortcake** (shôrt′kāk′), ***n.*** جۆرە کێکێکی ئیسفەنجی ئاسکە (گەلێك جار بە دۆندرمەوە دەخورێ).
**shortchange** (shôrt′chānj′), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.]. (۱) کەمتر پارەپێدانەوە لەوەی پێویستە (پارە ووردکردنەوە، کڕین و فرۆشتن)؛ بە ناتەواوی پارەپێدانەوە. (۲) گزی کردن؛ فێڵ کردن؛ ساختەکردن
**short-circuit** (shôrt′sũr′kit), ***v.t. & v.i.*** (۱) فیوز سووتاندن.
(۲) ڕێ لێگرتن؛ کۆسپ خستنەسەر ڕێ.
**short circuit,** (۱) خولی کورت (کارەبا). (۲) فیوز سووتاندن.
**shortcoming** (shôrt′kum′iŋ), ***n.*** کەم وکووڕی؛ کەم وکورتی؛ ناتەواوی؛ خەوش؛ ئەنگی.
**short-cut** (shôrt′kut′), ***n.*** (۱) قەدبڕ؛ کورتە ڕێ
(۲) ڕێگەی پاشەکەوت کردن، بەفیڕۆنەدان، لەکیس نەچوون، یا کورتکردنەوە (کات، ئەرك، خەرجی...هتد).
**short division,** کورتە دابەش کردن (ژمارەو پێوان).
**shorten** (shôr′t'n), ***v.t.*** (۱) کورتکردنەوە؛ کوڵ کردنەوە؛ کورتتر کردنەوە. (۲) هەڵکردنی بایەوان (بۆ کەمکردنەوەی کاری با لەسەر بایەوانی بەلەم و کەشتی). (۳) کەمکردنەوە (توندوتیژی، هێز...هتد)
(٤) ڕۆن کردنە هەویرەوە.
***v.i.*** کورت بوونەوە؛ کوڵ بوونەوە؛ کورتتر بوونەوە.
**shortened form,** شێوەی کورتکراوە (زمانەوانی):
(وەك " auto " بۆ " automobile ").
**shortening** (shôr′t'n-iŋ, shôrt′niŋ), ***n.*** (۱) کورتکردنەوە؛ کوڵ کردنەوە. (۲) شێوەی کورتکراوە (زمانەوانی)؛ کورتە (ووشە)
(۳) ڕۆن (چێشت لێنان)؛ چەوری.
**shortfall** (shôrt′fôl′), ***n.*** (۱) کەمی؛ ناتەواوی؛ کەم هێنان؛ کورت هێنان. (۲) ڕادەی کەمی یا ناتەواوی.
(۳) کەم هێنانی بووجە یا پارە؛ کورت هێنانی بووجە.
**short-hand** (shôrt′hand′), ***n.*** کورتەنووسی؛ کورتکردنەوەی نووسین لە ڕێی نیشانە بەکارهێنانەوە لەباتی ووشە.
***adj.*** (۱) کورتەنووسی بەکارهێن.
(۲) بە کورتی نووسراو (لە ڕێی نیشانە بەکارهێنانەوە).
**short-handed** (shôrt′han′did), ***adj.*** کرێکاری تەواوی نییە؛ پێویستی بە کارگەری ترە.
**short-horn** (shôrt′hôrn′), ***n.*** شاخ کورت: جۆرە مانگایەکی شاخ کورت و چەماوەیە (بۆ گۆشتیش و شیریش بەخێودەکرێ).
**shortish** (shôr′tish), ***adj.*** ئەختێك کورت.
**short-legged** (shôrt′leg′id, shôrt′legd′), ***adj.*** لاق کورت.
**short line,** هێڵ یا ڕێی کورت (شەمەندەفەر).
**short-lived** (shôrt′līvd′), ***adj.*** (۱) جوانە مەرگ؛ تەمەن کورت.
(۲) کەم خایەن؛ سەردەمی؛ زوو لەناوچوو؛ زۆر نەخایەن.
**shortly** (shôrt′li), ***adv.*** (۱) بە کورتی.
(۲) بەم زووانە؛ لەم نزیکانەدا: ***( He will arrive ~ .)*** .

(٣) لەپڕ: کوتوپڕ (٤) بە قسەی ڕەق: بە ناشرینی.
**shortness** (shôrt′nis), *n.* کورتی: کورتێتی
**short order,** خواردەمەنی پەلە؛ خواردەمەنی‌یەکی بە پەلە ئامادەکراو (لە چێشتخانەدا)
**-short-order** *(adj.).*
**in short order,** خێرا: بە پەلە
**short-range** (shôrt′rānj′), *adj.* (١) بۆ ماوەیەکی کورتە (نەخشە، پیلان)؛ کورت (ماوە): *( ~ plans)*
(٢) کورت مەودا؛ هەر بۆ مەودایەکی کورت کراوە. دەگات یا بڕدەکات.
**short rib,** توێ گۆشتی لاپەراسووی گا.
**short sale,** جۆرە فرۆشتنێکی بەشی کۆمپانیای هاوبەشی‌یە کە فرۆشیار هێشتا بەشەکانی نەبێ، بەڵام بەتەمابێ دەستی کەوێ پێش کاتی خۆی بە هەرزان (پارەبازی).
**short short story,** چیرۆکی ئێجگار زۆر کورت (کە تەنها لاپەڕەیەک بێت)
**short shift,** (١) (أ) مۆڵەت پێدانی پێش کوشتن یا مردن.
(ب) [Archaic]، ماوەپێدان پێش هەڵواسین بۆ دان بە گوناهدا نان.
(٢) خستنە پشت گوێ: گوێ پێ نەدان؛ فەرامۆش کردن؛ ناهاوسۆزی.
(٣) ماوە پێ نەدان؛ بێ بەزەییێتی: دڵرەقی.
**make (or give) short shift of,** هیچ گوی پێ نەدان؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ سەرکردن بە گۆمدا بە پەلە
**short-sighted** (shôrt′sīt′id), *adj.* (١) نزیکبین: کورتبین
(٢) کورتبین (مەجاز): بیر لە دوارۆژ نەکەرەوە؛ دوورنەبین؛ دووربینی نی‌یەو ناکات *( a ~ plan, person, etc.)* .
**-short-sightedly** *(adv.)*; **short-sightedness** *(n.).*
**short snort,** [Slang], پێکێکی بە پەلە.
**short-spoken** (shôrt′spō′k′n), *adj.* (١) نەدوو: کەم دوو: کەم وێژ (٢) قسە ڕەق (لەبەر کورتی).
**short-stop** (shôrt′stop′), *n.* یاریکەری بەرگر (یاری بێسبۆل).
**short story,** کورتە چیرۆک. چیرۆکی کورت؛ چیرۆک
**short-tempered** (shôrt′tem′pērd), *adj.* تەنگەحیکڵانە: سەرگەرم: توورەوتڕۆ؛ زوو توورە دەبێ.
**short-term** (shôrt′tûrm′), *adj.* ماوە کورت (قەرز؛ دەبێ زوو بدرێتەوە): *( a ~ loan)* .
**short ton,** تەنی ئەمەریکی (بریتی‌یە لە دووهەزار پاوەن).
**short wave,** شەپۆلی کورت (ڕادیۆ)
**short-wave** (shôrt′wāv′), *adj.* هی شەپۆلی کورت (ڕادیۆ).
**short-winded** (shôrt′win′did), *adj.* (١) زوو هەناسەی لێ دەبڕێ: زوو هەناسەی سوار دەبێ. (٢) کورت‌و پچڕپچڕ (نووسراو).
**shorty** (shôr′ti), *n.* [Colloq.], کورتە بالا؛ کورتە بنە: کوڵە بالا.
**shot** (shot), *n.* (١) تەقە (٢) گوللە؛ فیشەک؛ گوللە تۆپ.
(٣) (أ) مەودای گوللەو مووشەک. (ب) مەودا؛ ماوەی بڕکردن یا گەیشتن.
(٤) هەوڵی پێکاندن یا تێگرتن.
٥) (أ) هەوڵ. (ب) گۆترەکاری؛ قەبلاندن؛ هەڵهێنان (مەتەڵ).
(٦) تێبینی‌یەکی توندوتیژ
(٧) هاویشتن (تۆپ)؛ لێدان؛ هەڵدان (مووشەک): *( a moon ~ )* .
(٨) تۆپی ئاسنی قورسی هاوێژراو (یاری، وەرزش).
(٩) (أ) قورقوشمی ساچمە. (ب) ساچمەی تفەنگ.
(١٠) تەقینەوە: تەقە؛ تەقەمەنی بەکارهێنراو بۆ تەقینەوەیەک (کانزاکاری).
(١١) نیشانچی: نیشان شکێن؛ دەست ڕاست: *( He's a good ~ .)* .
(١٢) وێنە
(١٣) خەرجی (بەتایبەتی لە مەیخانەو تیاترۆدا)؛ بەشە خەرجی کەسێکە کە دەبێت بیدات *( to pay one's ~ )*
(١٤) [Colloq.]، پێکی یەکسەر، واتە تێکەڵاونەکراو؛ قوم (خواردنەوەی کحولی یەکسەر نەک تێکەڵاو)
(١٥) [Colloq.]، شرینقە؛ دەرزی:
*( The doctor gave the patient a ~ .)*
(١٦) [Colloq.]، شتی گرەو لەسەرکراو (لەڕووی بردنەوەوە سەیرکردن):
*( That horse is a twenty-to-one ~ .)*
(١٧) پێوانەیەکی زنجیرو پەتە بریتی‌یە لە پانزە شەش پێ (کەشتیوانی).
(١٨) [Slang]، big shot .
**a long shot,** (١) هەوڵدانێکە کە لەوانە نی‌یە سەرکەوێ.
(٢) [Colloq.]، گرەوێکە کە زۆر لەوانەیە بدۆڕێ.
(٣) [Colloq.]، کەسێك یا شتێکە کە هیچ لەوانە نەبێ سەرکەوێ.
**have (or take) a shot at,** [Colloq.], دەستی خۆ پێ تاقیکردنەوە؛ تاقیکردنەوە.
**like a shot,** (١) خێرا؛ زوو. (٢) لەپڕ؛ کوتوپڕ.
**shot in the arm,** بووژانەوە؛ پاڵ؛ پاڵ پێوەنان؛ یارمەتی؛ برەوپێدان.
**shot in the dark,** (١) بە کوێرانە تێگرتن؛ بە کوێرانە خەملاندن؛ گۆترەکاری. (٢) هەوڵدانێکە کە هیچ لەوانە نەبێ سەرکەوێ.
**shot** (shot), *past tense and past participle of* **shoot.**
*adj.* (١) (أ) شەپۆلاوی‌و ڕەنگاوڕەنگ (کاڵا، ئاوریشم)؛ ڕەنگ شەپۆلاوی.
(ب) جیاواز؛ هەمەڕەنگ؛ دوو ڕەنگ.
(٢) [Colloq.]، فەوتاو؛ پەککەوتوو؛ لە کەڵك کەوتوو؛ زۆر ماندوو:
*( His nerves are ~ .)*
(٣) [Colloq.]، سەرخۆش؛ کەیل.
(٤) [Colloq.]، ژێرکەوتووە؛ هەلی لە دەست چووە؛ تازە دەستی لێ بشۆ:
*( His chances are ~ .)*
**shote** (shōt), *n.* = **shoat.**
**shotgun** (shot′gun′), *n.* تاپڕ.
*adj.* (١) هی ساچمەزەن. (٢) بە زۆرەملێ؛ بە زۆر.
(٣) مەودایەکی زۆر فراوان دەگرێتەوە بە "شەلم کوێرم ناپارێزم"
**shotgun marriage or wedding,** ژنهێنان یا شایی زۆرەملێ (لەبەر سکپڕی کچەکە).
**shotput** (shot′poot′), *n.* (١) بۆڕبۆڕێنی هاویشتنی تۆپی قورسی ئاسن (وەرزش). (٢) هاویشتنێکی وەها.
(٣) ئەم تۆپە قورسە ئاسنە (پێشی دەووترێ: "shot" ).
**shotten** (shot′′n), *adj.* (١) تازە گەرای کردووە لەبەرئەوە بۆ خواردن ئەوەندە باش نی‌یە (ماسی): *( ~ herring)* .
(٢) [Archaic]، بێ نرخ؛ بێ فەڕ؛ بێ برەو.
**should** (shood), *v.* (١) کردارێکی یاریدەدەرە بەم مانایە: (أ) پێویستە؛ دەبێ: *( Children ~ obey their parents.)* .
(ب) دەبێ؛ هەڵبەت:
*( Since they left yesterday they ~ arrive here today.)*
(ج) شێوەی ڕابوردووی " shall " ە لە گۆڕینی ووتەی ڕاستەوخۆوە بۆ ناڕاستەوخۆ: *( I said I ~ be home by ten o'clock.)* .
(د) بۆ ئەزاکەت‌و داوای دوودڵی بەکاردەهێنرێت:
*( I ~ think he'd like to be invited to our meeting.)*
(هـ) مەرجی دوارۆژ: *( If I ~ go, would you be there ?)*
(و) مەرجی ڕابوردوو: *( I ~ have gone, but you never asked me.)* .
**shoulder** (shōl′dēr), *n.* (١) شان.
(٢) *(pl.)*، هەردوو شان‌و ناوشان (بەتایبەتی بە مەجاز بۆ ئەرك هەڵگرتن).
(٣) پارچە گۆشتی شان. (٤) شانی جل‌وبەرگ.
(٥) شتێکی دەرپەڕیو وەك شان. (٦) شانی سەنگەر.
(٧) لاشانی ڕێگە؛ قەراغە ڕێ.
*v.t.* (١) درپێدانی جەماوەر بە شان:
*( He ~ed his way through the crowd.)*
(٢) (أ) هەڵگرتن بە شان.
(ب) خستنەسەر شانی خۆ؛ شان دانەبەر؛ شان پێوەنان؛ هەڵگرتن (مەجاز):
*( to ~ one's responsibility)*

*v.i.* به شان پال پێوەنان؛ بە شان درپێدان؛ شان پێوەنان.

**cry on someone's shoulder,** سکاڵای خۆ لا کردن؛ دڵی خۆ بۆ هەڵڕشتن و چاوەڕێی هاوسۆزی لێکردن؛ چوونەلا بۆ هاوسۆزی یا هاوخەمی

**put one's shoulder to the wheel,** شان دانەبەر کار؛ شان پێوەنان؛ کۆشش کردن.

**rub shoulders with,** شان لە شان خستن (بەتایبەتی هی کەسانی بەناوبانگ)؛ چوونە ناو خەڵکەوە (بەتایبەتی هی ناودار)؛ تێکەڵاوی خەڵك بوون.

**shoulder to shoulder,** (١) بەتەنیشت یەکەوە؛ بەلای یەکەوە. (٢) شان بە شانی یەکتر؛ هاوکاری کردن بۆ هەمان ئامانج:
[ *to stand* ( or work) *shoulder to shoulder* ]

**straight from the shoulder,** (١) یەکسەر لە شانەوە هاتوو (مستەکۆڵە. لێدان). (٢) ڕاستەوڕوو؛ بەبێ هیچ شاردنەوە؛ لەڕوو؛ بە ئاشکرا.

**turn (or give) a cold shoulder to,** (١) ساردوسڕ لەگەڵدا؛ بە ساردی ڕەفتار لەگەڵ کردن؛ گوێ پێ نەدان. (٢) خۆ لێ دزینەوە؛ خۆ لێ لادان.

**shoulder blade,** دەفەی شان

**shoulder girdle,** = pectoral girdle.

**shoulder knot,** نەخشەگرێی سەر شان (بۆ جوانی یا نیشانە ئەفسەرو هەندێ پیشەگەر دەیدروون بەسەر شانیاندا).

**shoulder pad,** قەنەواچە

**shoulder patch,** پینە یا نیشانەی سەر باڵی ئەفسەرو سەربازو پۆلیس

**shoulder strap,** قایشی شان (جانتا هەڵگرتن).

**shouldest** (shood′ist), = **shouldst.**

**shouldn't** (shood′'nt), = **should not.**

**shouldst** (shoodst), [Archaic], شێوەی ڕابوردووی کرداری "**shall**" ە بۆ کەسی دووەم بەمانای " پێویست بوو" (لەگەڵ "**thou**" بەکاردێت) (ڕێزمان): *( Thou ~ have been there.)* .

**shout** (shout), *n.* قیژە؛ قیرە؛ شیرە؛ هاوار؛ نەڕاندن؛ هەرا.

*v.t. & v.i.* قیژاندن؛ قیراندن؛ هاوارکردن؛ نەڕاندن.

**shout (someone) down,** بە دەنگی بەرزتر قیژاندن بەسەر کەسێکی تردا و بێ دەنگ کردن یا قسە پێ بڕین.

**shove** (shuv), *v.t. & v.i.* (١) پاڵ پێوەنان بە توند. (٢) پاڵ نان بە ناشرینانەو بێ نەزاکەتانە؛ پاڵەپەستۆکردن؛ درپێدان. (٣) [Colloq.]: تێخستن؛ خستنە ناو: *( ~ it in the drawer.)* .

*n.* پاڵی قایم؛ پاڵ.

**shove it,** [Vulgar Slang], بیخەرە قنگتەوە؛ بیبەرەوە خۆت. (وەڵامی کەسێکە کە شتێکی بدرێتێ و بەدڵی نەبێ).

**shove off,** (١) پاڵ بە بەلەمەوە نان بۆ ناو ئاو (بۆ دەست بە گەشت کردن). (٢) [Colloq.]، (أ) ڕۆیشتن؛ چوون. (ب) برۆ!؛ لاچۆ لەبەر چاوم؛ لاچۆ لێرە!. (٣) [Slang]، کوشتن.

**shovel** (shuv′'l), *n.* (١) خاکەناز (٢) **shovelful** . (٣) **shovel hat** .

*v.t.* (١) بە خاکەناز گواستنەوە یا فڕێدان؛ ڕامالین یا پاك کردنەوە بە خاکەناز. (٢) خاکەنازکاری کردن؛ هەڵکەندن و ڕێك کردن بە خاکەناز. (٣) زۆر تێکردن؛ تێدا هەڵڕشتن: *( He ~ed sugar into his coffee.)* .

**shovelbill** (shuv′'l-bil´), *n.* = **shoveler # 2.**

**shovel-board** (shuv′'l-bôrd´), *n.* = **shuffleboard.**

**shoveler, shoveller** (shuv′'l-ēr), *n.* (١) خاکەنازکار؛ ڕامالەر بە خاکەناز (٢) دەنووك خاکەناز: مراوییەکی دەنووك خاکەنازییە. (پێشی دەووترێ: " **shovelbill** ").

**shovelful** (shuv′'l-fool´), *n.* پڕ خاکەنازێك.

**shovel hat,** شەپقەی خاکەنازییە جۆرە شەپقەیەکی ڕەقی تەرقەسەر نزمی لێوار پانە و هەڵگەڕاوەیە (قەشەی ئینگلیز دەیکەنە سەریان)

**shovel-head** (shuv′'l-hed´), *n.* (١) سەر خاکەنازی کۆسەیەکی بچووکە. (٢) جۆرە ماسییەکی لووت پانە.

**shoveller** (shuv′'l-ēr), *n.* = **shoveler.**

**shovelnose** (shuv′'l-nōz), *n.* جۆرە ماسییەکی لمۆز پانی ڕووباری میسیسیپییە. (پێشی دەووترێ: " **shovelnosed sturgeon** ").

**shovel-nosed** (shuv′'l-nōzd´), *adj.* سەرپان؛ دەنووك پان؛ لمۆز پان؛ لووت پان.

**show** (shō), *v.t.* (١) پیشاندان؛ نیشاندان؛ خستنە بەرچاو؛ خستنەڕوو؛ خستنە پێش چاو. (٢) نواندن لە پیشانگادا (تابلۆ، گوڵ، گیاندار). (٣) ڕێ پیشاندان؛ ڕابەری کردن:
*( The bellboy ~ed him to his room.)*
(٤) سەرنج بۆ ڕاکێشان؛ پیشاندان: *( We ~ed him the sights.)* .
(٥) پیشاندان (هەست، هەڵوێست)؛ دەرخستن:
*( The judge ~ed mercy to the prisoners.)*
(٦) ڕوونکردنەوە؛ پیشاندان:
*( He has ~n the difference between them.)*
(٧) سەلماندن؛ دەرخستن:
*( Scientists have ~n that it is possible.)*
(٨) نواندن؛ دەرخستن: *( He has ~n himself to be reliable.)*
(٩) نیشاندان؛ تۆمارکردن: *( A barometer ~s the air pressure.)*
(١٠) پێدان (خەڵات)؛ لەگەڵ کردن (چاکە).
(١١) خستنە بەرچاو؛ وا ووتن؛ وا پیشاندان (دادگەری): *( to ~ cause)* .

*v.i.* (١) دەرکەوتن؛ هاتنەڕوو؛ کەوتنەڕوو؛ هاتنە بەرچاو.
(٢) سەرنج ڕاکێشان؛ دیاربوون: *( The scratch won't ~ .)* .
(٣) وا دەرکەوتن؛ ڕواڵەتێکی تایبەتی هەبوون:
*( It ~s poorly in this light.)*
(٤) سێهەم بوون (غارغارێن، پێشبڕکێی سەگ).
(٥) خۆنواندن (شانۆگەری)؛ نواندن.

*n.* (١) پیشاندان؛ دەرخستن: *( a ~ of passion)* .
(٢) پیشاندانێکی جوان و سەرنج ڕاکێش.
(٣) کەش وفش؛ خۆدەرخستن؛ تەنتەنە؛ خۆبادان.
(٤) ڕووکەش؛ ڕواڵەت: *( Her sympathy was mere ~ .)* .
(٥) کەسێك یا شتێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش.
(٦) پیشانگا (تابلۆ، هونەر): *( an art ~ )* .
(٧) پیشاندان (شانۆ، سینەما، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ بەرنامە:
*( The ~ begins at 8:00 o'clock.)*
(٨) [Colloq.]، کار؛ کردار؛ پرۆژە؛ ئەنجام.
(٩) پلەی سێهەم (غارغارێن، پێشبڕکێی سەگ): *( win, place, and ~ )*
(١٠) [Military Slang]، جەنگ؛ هێرش.

**for show,** بۆ خۆدەرخستن؛ بۆ خۆنواندن؛ بۆ سەرنج ڕاکێشان.

**show a person the door,** دەرکردن؛ کردنە دەرەوە.

**show in,** بردنە ژوورەوە؛ ڕێی ژوورەوە پیشاندان.

**show off,** (١) نواندن؛ پیشاندان بە جۆرێك کە سەرنج ڕاکێشێ. (٢) خۆبادان؛ خۆنواندن؛ خۆفشکردنەوە؛ کەشخەکردن؛ خۆدەرخستن.

**show out,** ڕێی دەرەوە پیشاندان.

**show up,** (١) دەرخستن (کەموکوڕی)؛ دەرکەوتن؛ هاتنەڕوو؛ پیشاندان. (٢) دیاربوون؛ لەبەرچاوبوون؛ باش دەرکەوتن. (٣) سەرهەڵدان؛ هاتن؛ دەرکەوتن. (٤) [Colloq.]، زۆر باشتربوون لە.

**show bill,** ئاگاداری (کە هەڵدەواسرێ بە شوێنێکدا).

**show biz,** [Slang], = **show business.**

**showboat** (shō′bōt´), *n.* بەلەمی شانۆگەری؛ بەلەمی نواندن؛ بەلەمێکە شانۆنامەی تێدا پێشکەش دەکرێ لەسەر ڕووبار.

**show-bread** (shō′bred´), *n. Also* shewbread, نەو دوانزە هەویرترش تێنەکراوەیە کە لە کڵێسەی جوولەکەدا هەموو شەممەیەك دادەنرێت

**show business,** هونەری سینەما و شانۆ و تیاترۆ و تەلەفزیۆن.

**showcase** (shō′kās´), *n.* (١) جامخانە (فرۆشگا)؛ شووشەبەندی کۆگا.

(۲) پیشانگای جوان و ڕێك‌وپێك

*v.t.* پیشاندان به جوانی و ڕێك‌وپێكی (وەك لە پیشانگادا).

**showdown** (shō′daun´), *n.* (۱) دەست خستنەڕوو (یاری پۆکەر)؛ کاغەزی یەکەی خستنەڕوو. (۲) دەرکەوتنی ڕاستی شتێك یا بارێك.

(۳) بڕینەوەی ناکۆکی بە ڕووبەڕووی یەك وەستان؛ ڕووداوێکە کە دەبێتە هۆی بەرەنگاری بوونی یەکتری و بڕینەوەی ناکۆکی‌یەك؛ دەست خستنەڕوو (مەجان).

**shower** (shō′ēr), *n.* پیشاندەر

**shower** (shou′ēr), *n.* (۱) ئاوە باران (یا تەرزە).

(۲) پرژ؛ پرژان؛ هەڵپرژان.

(۳) لێشاو (مەجان)؛ ژمارەیەکی زۆر؛ ووروژم. *( a ~ of complaints)* .

(٤) ئاهەنگێکە دەکرێ بۆ بووك پێش گواستنەوەی یا بۆ ئافرەت پێش منداڵ بوونی لەلایەن ژنەکانی برادەریەوە و دیاری دەدەنێ: *( a bridal ~ )* .

(٥) دووش: ئاوپرژێنی گەرماو؛ ئاوپرژێن: *( to take a ~ )* .

*v.t.* (۱) لێ هەڵپرژان: ئاوپرژێن کردن؛ ئاو لێ هەڵپرژاندن.

(۲) هەڵرشتن بەسەردا؛ بەسەردا هەڵپرژان:

*( He ~ed gifts up on us.; to ~ with gifts)*

*v.i.* (۱) هەڵپرژان: بە تاو بارین

(۲) خۆشتن بە دووش؛ خۆشۆردن بە ئاوپرژێنی گەرماو:

*( She ~s once a day.)*

-showery *(adj.)*.

**shower bath,** (۱) ئاوپرژێنی گەرماو؛ خۆشتن بە دووش؛ دووش.

(۲) گەرماوی دووشدار؛ سەرشۆرکی دووشدار.

**showgirl** (shō′gūrl), *n.* کچی سەمەکەر یا گۆرانی بێژی شانۆنامەی مۆسیقایی

**showing** (shō′iŋ), *n.* (۱) پیشاندان؛ خستنە بەرچاو:

*( a ~ of evidence)*

(۲) پیشانگا.

**showman** (shō′mən), *n.* (۱) کارگێری پیشاندانێکی سەر شانۆ؛ دەرهێنەری شانۆنامە. (۲) کەسێکە بە جوانی شت دەنوێنێ یا پێشکەشی دەکات

**showmanship** (shō′mən-ship´), *n.* (۱) هونەری کارگێری پیشاندانێکی سەر شانۆ. (۲) هونەری شت بە جوانی نواندن یا پێشکەش کردن

**show-me** (shō′mē), *adj.* گومانکەر؛ بە گومان؛ بڕوا بە هیچ نەکەر جگە لە شتی بینراو.

**shown** (shōn), *alternative past participle of* **show.**

**show-off** (shō′ôf´), *n.* (۱) خۆدەرخستن؛ خۆنواندن؛ خۆبادان؛ کەشخەکردن؛ خۆفشکردنەوە. (۲) خۆدەرخەر؛ خۆبادەر؛ کەشخەچی؛ خۆنوێن؛ خۆفشکەرەوە

**show of hands,** دەست هەڵبڕین یا بەرزکردنەوە (بۆ دەنگدان لە کۆڕێکدا یا لە ئەنجوومەنێکدا وەك هی پەرلەمان).

**show-piece** (shō′pēs´), *n.* (۱) شتێکی پیشان دراو لە پیشانگادا.

(۲) نموونەی باش یا ئەنتیکە؛ نموونەی جوان و نایاب بۆ پیشاندان.

**show place,** شوێنێکە کە خەڵك بۆی دەچن لەبەر جوانی و ئەنتیکەیی و گرنگی مێژوویی ...هتد

**show-room** (shō′rōōm´, shō′room´), *n.* پیشانگە

**show window,** جامخانە

**showy** (shō′i), *adj.* (۱) جوان و دڵگیر؛ ڕازاوە؛ جوان نوێن:

*( ~ flowers)*

(۲) زەق (ڕەنگ)؛ بریقەدار و هەرزانبەها و زەق؛ سەرنج ڕاکێش بە ناشرینی.

(۳) خۆنوێن؛ خۆدەرخەر؛ بە کەش‌وفش؛ سەرنج ڕاکێش.

-showily *(adv.)*; showiness *(n.)*.

**shrank** (shraŋk), *alternative past tense of* **shrink.**

**sharpnel** (sharp′nəl), *n.* (۱) بۆمبای تەڵەزمدار: بۆمبایەکە کە دەتەقێتەوە تەڵەزمەکانی پرش و بڵاودەبنەوە. (۲) تەڵەزمی بۆمبا؛ تەڵەزمی ئاسنی بۆمبا.

**shred** (shred), *n.* (۱) پڕزۆڵە؛ شیتاڵ؛ ڕیشاڵە.

(۲) تۆز؛ ئەخت؛ دەنك؛ ئەختاڵ:

*( There's not a ~ of truth in it.; a ~ of evidence)*

*v.t.* شیتاڵ شیتاڵ کردن؛ ورنجر ورنجر کردن؛ پڕزۆڵە پڕزۆڵە کردن.

-shreder *(n.)*.

**shrew** (shrōō), *n.* (۱) گیاندارێکە لە مشك دەچێت لووتی درێژە مێش و مەگەز دەخوات. (پێشی دەوترێ: " **shrew mouse** ").

(۲) ژنی زمان پیسی بێ حەیای تووڕە و ترۆزی چەقاوەسوو.

**shrewd** (shrōōd), *adj.* (۱) زۆرزان؛ زیرەك؛ سەردەرچوو؛ زیرەك و قومارباز؛ شەیتان؛ دانا: *( a ~ businessman, polician, etc.)*

(۲) [Archaic]، (ا) تیژ؛ بڕ. (ب) فێڵباز؛ تەڵەکەباز.

(۳) [Obs.]، (ا) بەدخوا؛ بەد؛ ناپەسەند. (ب) نۆینباز؛ کەتنچی (ج) **shrewish** .

**shrewish** (shrōō′ish), *n.* زمان پیس و بێ حەیا و تووڕە و ترۆز و چەقاوەسوو (ئافرەت).

**shrew-mouse** (shrōō′mous´), *n.* = **shrew #1.**

**shriek** (shrēk), *v.i. & v.t.* قیژاندن؛ شریخاندن؛ شیڕاندن؛ زریکاندن؛ زیڕاندن.

*n.* قیژە؛ قیژەقیژ؛ شریخە؛ شیڕە؛ زریکە؛ قیژوهوور؛ زیڕە.

**shrievalty** (shrēv′′l-ti), *n.* (۱) پلەوپایەو دەسەڵاتی تایبەتی بە " **sheriff** " . (۲) ناوچەی ژێر دەسەڵاتی " **sheriff** "

**shrieve** (shrēv), *n.* [Obs.], = **sheriff.**

**shrift** (shrift), *n.* [Archaic], (۱) دان بە گوناهدا نان لەبەردەمی قەشەدا. (۲) گوناه بەخشین لەلایەن قەشەوە (پاش گوێگرتن لە دان بە گوناهدا نان).

**shrike** (shrīk), *n.* باڵندەیەکی دەنووك نوشتاوەی پەڕو باڵ ڕەش و سپی و بۆری کلك درێژە (لەسەر جانەوەرو باڵندەی بچووك و بۆق دەژی)

**shrill** (shril), *adj.* (۱) بەرز و تیژ و ناساز (دەنگ): *( a ~ voice)* .

(۲) [Archaic or Poetic]، تیژ؛ بڕ.

*v.i. & v.t.* قیژاندن؛ شیڕاندن؛ دەنگی تیژ و بەرز و ناساز لێوەهاتن.

-shrilly *(adv.)*; **shrillness** *(n.)*.

**shrimp** (shrimp), *n.* (۱) کوللەی دەریا؛ ڕۆبیان: گیاندارێکی دەریایی قاوغ نەرمە دەخورێ. (۲) [Colloq.]، کەسێکی بچووك و هیچ‌وپووچە

**shrine** (shrīn), *n.* (۱) دەفری شتی پیرۆز (وەك ئێسقانی پیاوچاك)؛ قوتو یا سنووقی مووفەڕك. (۲) نزرگە؛ گۆڕی پیاوچاك؛ پەرستگا.

(۳) پیرۆزگا؛ شوێنی پیرۆز.

*v.t.* هەڵگرتن لە دەفرێکدا وەك شتی پیرۆز؛ بە پیرۆز دانان؛ وەك شت یا جێگەی پیرۆز سەیرکردن.

**shrink** (shriŋk), *v.i.* (۱) چوونەوەیەك (جل‌وبەرگ)؛ هەڵچوون؛ هەڵقرچان؛ کرژبوون؛ بچووك بوونەوە:

*( Woolen clothes often ~ when they are washed.)*

(۲) کەم بوونەوە؛ کزبوون: *( Our resources are ~ing.)* .

(۳) سڵ کردنەوە؛ سڵەمینەوە؛ خۆکشانەوە؛ خۆ لێ لادان؛ دوودڵی کردن:

*( A shy man ~s from meeting strangers.)*

*v.t.* چواندنەوەیەك؛ کرژکردن (جل‌وبەرگ)؛ بچووك کردنەوە (بە هەڵچوواندن)

*( You can ~ this shirt by washing it in hot water.)*

*n.* (۱) چوونەوەیەك؛ کرژبوون؛ بچووك بوونەوە؛ کەم بوونەوە؛ کزبوون

(۲) [Slang]، پزیشکی دەروون؛ دەروونناس.

-shrinkable *(adj.)*.

**shrinkage** (shriŋk′ij), *n.* (۱) چوونەوەیەك؛ هەڵچوون؛ کرژبوون؛ هەڵقرچان؛ بچووك بوونەوە.

(۲) کەم بوونەوە؛ کزبوون: *( a ~ of the export trade)* .

(۳) ڕادەی کەم بوونەوەی کێشی ڕەشەووڵاخ لە زیندوویێتی‌یەوە بۆ فرۆشتنی بە گۆشتی.

**shrive** (shrīv), *v.t.* (١) گوێگرتنی قەشە لە دان بە گوناهدا نانی گوناهبارێك و بەخشینی (ئاینی کاسۆلیکی).
(٢) [Archaic or Rare]، پێ لە گوناه نان و بەخشران (ئاینی کاسۆلیکی).

**shrivel** (shriv′'l), *v.i.* (١) هەڵقرچان؛ چرچ و لۆچ بوون؛ سیس بوونەوە؛ تێ قوپان؛ چوونەوەیەك؛ پووكانەوە:
***( The leaves ~led up in the heat.)***
(٢) لاوازبوون؛ بێ هێز بوون؛ سیس بوونەوە؛ پەككەوتن؛ چوونەوەیەك (مەجاز):
***( Their spirits ~led in the repressive atmosphere.)***
***v.t.*** هەڵقرچاندن: سیس کردنەوە؛ پووكاندنەوە؛ چرچ کردن.

**shriven** (shriv′'n), *altrtnative past participle of* **shrive**.

**shroff** (shrof), ***n.*** (١) بانقچی: پارە گۆڕەرەوە؛ "سەرِاف".
(٢) پاك و پیسكەری پارەی وردە؛ تاقیكەرەوەی پارەی وردە بۆ دۆزینەوەی ئەوەی قەڵبە.
***v.t.*** تاقیكردنەوەی پارەی وردە و جیاكردنەوەی ئەوەی قەڵبە؛ پاك و پیس كردنی پارەی وردە.

**Shropshire** (shrop′shir), ***n.*** جۆرە مەڕێكی گەورەی دەم و چاو ڕەشی بێ شاخی ئینگلیزییە (لەناوچەی "شرۆپشر" ەوە هاتووە).

**shroud** (shroud), ***n.*** (١) كفن.
(٢) پۆش؛ پەردە؛ پۆشاك؛ تارا؛ پەنا: ***( a ~ of darkness, mist, etc.)*** .
(٣) پەتی داری بەلەم و كەشتی بایەوان.
***v.t.*** (١) شاردنەوە؛ داپۆشین؛ بەرچاوگرتن:
***( mountains ~ed in mist)***
(٢) كفن كردن
(٣) [Archaic]، پاراستن؛ پەنادان.
***v.i.*** [Archaic], پەنا بۆ بردن

**shrub** (shrub), ***n.*** دەوەن؛ بنچك.

**shrub** (shrub), ***n*** خواردنەوەیەكی كحولییە لە براندی یا ڕەم و خۆشاو و شەكر پێكدێت.

**shrubbery** (shrub′ẽr-i), ***n.*** (١) دەوەنەكان؛ دەوەن و بنچكەكان.
(٢) شوێنی دەوەناوی.

**shrubby** (shrub′i), ***adj.*** (١) دەوەناوی: بە دەوەن داپۆشراو.
(٢) لە دەوەن دەچێت؛ لە بنچك دەچێت.

**-shrubbiness *(n.)*.**

**shrug** (shrug), ***v.t. & v.i.*** شان هەڵتەكاندن (لەڕووی سەرسامی، گوێ پێ نەدان، بێباكی، گاڵتەپێهاتن، یا ناچارییەوە).
***n.*** (١) شان هەڵتەكان. (٢) چاكەتێكی كورتی ژنانەیە هەتا ناوقەد.

**shrug off,** (١) بە بێباكانە وەرگرتن؛ بە لاسەرلایی گرتن؛ گوێ پێ نەدان؛ بە هیچ دانان: ***( He shruged off his financial difficulties.)*** .
(٢) لە كۆڵ خۆ كردنەوە؛ خۆ لێ ڕزگاركردن: ***( shrugging off sleep)*** .
(٣) جل لەبەر خۆ داكەندن بە زەحمەت و بە پێچ بە لەشدا هێنان.

**shrunk** (shruŋk), *alternative past tense and p.p. of* **shrink.**

**shrunken** (shruŋk′'n), *alternative p.p. of* **shrink.**
***adj.*** هەڵقرچاو؛ چووەوەیەك؛ تێ قوپاو؛ پووكاوە.

**shuck** (shuk), ***n.*** (١) تونكڵ؛ كەلوو؛ توێك.
(٢) قاوغ (گوێچكەماسی)؛ قاقلە.
(٣) (*pl.*) [Colloq.]، شتێكی هیچ و پووچ یا بێ نرخ؛ شتێكی بێ قەدر:
***( not worth ~s)***
***v.t.*** (١) پاكردن: تونكڵ لێكردنەوە؛ توێك لێ فڕێدان؛ قاوغ لێكردنەوە.
(٢) لەبەر داكەندن: فڕێدان؛ داكەندن: ***( He ~ed his clothes.)*** .

**not worth shucks,** بایی هیچ نییە؛ بێ قەدرە؛ بێ نرخ و هیچ و پووچە.

**shucks** (shuks), ***interj.*** ووتەیەكە لەڕووی بێزارییەوە وەك: بە زیاد نەبێ!؛ ئەی خوا بە زیادی نەكات!؛ ئەی خوا بیبڕێ.

**shudder** (shud′ẽr), ***v.i.*** (١) لەرزین؛ مووچڕك پیاهاتن؛ تەزوو پیاهاتن. ***( They ~ed at the thought of hard work.)*** .
(٢) لەرینەوە.
***n.*** لەرز؛ لەرزین؛ مووچڕك؛ تەزوو؛ لەرە.

**shuffle** (shuf′'l), ***v.t.*** (١) (ا) قاچ ڕاكێشان بەسەر زەویدا لە ڕۆیشتندا:
***( to ~ one's feet)***
(ب) پێ لە زەوی خشان یا بە ئاستەم بەرزكردنەوە لە سەمادا.
(٢) تێكەڵ كردنی كاغەزی یاری یا قومار.
(٣) تێكەڵاوكردن؛ تێكەڵ و پێكەڵ كردن؛ بەسەریەكدادان.
(٤) (ا) گوێزانەوە؛ جێگۆڕكێ پێكردن. (ب) ڕێكخستنەوە؛ گۆڕین.
(٥) شاردنەوە؛ تێخستن یا لێ دەرهێنان بە ناقۆڵایی یا بە فێڵبازی.
***v.i.*** (١) قاچ ڕاكێشان بە زەویدا لە ڕۆیشتندا.
(٢) خۆدزینەوە (لە ئەرك) بە درۆ و دەلەسەو فێڵ و تەڵەكە؛ خۆ نەدان بەدەستەوە؛ بەسەر خەڵكدا دان (ئەرك): ***( to ~ off responsibility onto others; He has ~ out of responsibility time and time again.)***
(٣) فێڵبازی كردن؛ خۆپەڕاندنەوە بە فێڵبازی؛ ناپاكی كردن؛ ساختەكردن
(٤) جێگۆڕكێ پێكردن جار لەدوای جار؛ هەمیشە هەڵوێست یا جێ گۆڕین
(٥) تێكەڵ كردن (كاغەزی یاری و قومار، دۆمینە).
(٦) بە ناقۆڵایی جل لەبەركردن یا داكەندن.
***n.*** (١) تێكەڵاوكردن؛ تێكەڵ و پێكەڵ كردن.
(٢) خۆدزینەوە (بە درۆ و دەلەسەو فێڵبازی)؛ خۆپەڕاندنەوە (بە فێڵ و تەڵەكە)؛ خۆ نەدان بە دەستەوە؛ چەوتی؛ سەرچەوتی.
(٣) قاچ خشاندن بە زەویدا لە ڕۆیشتندا؛ ڕەوتێكی وەها.
(٤) پێ ڕاكێشان بە زەویدا لە سەماكردندا.
(٥) (ا) تێكەڵ كردن (كاغەزی یاری و قومار، دۆمینە).
(ب) نۆبەی یاریكەرێك بۆ ئەم تێكەڵ كردنە.
(٦) گۆڕین؛ جێگۆڕكێ؛ ڕێكخستنەوە.

**-shuffleness *(n.)*.**

**shuffle off,** لە كۆڵ خۆ كردنەوە؛ سەر بە گۆمدا كردن؛ خۆ لێ ڕزگاركردن

**shuffleboard** (shuf′'l-bôrd´), ***n.*** *Also* **shovelboard,** (١)- یارییەكە بریتییە لە پاڵ پێوەنان یا خلیسكاندنی خەپلەی دارین بە گورزێكی دەم پان بەسەر ڕوویەكی تەخت و ساف و لووسی خانە خانە كراو و ژمارە لەسەر دانراودا. (٢) ئەم ڕووە تەخت و ساف و لووسەی كە ئەم یارییەی لەسەر دەكرێ.

**shun** (shun), ***v.t.*** خۆ لێ لادان؛ لێ تەكینەوە؛ خۆ لێ دوورخستنەوە؛ لێ دووركەوتنەوە.

**shunpike** (shun′pīk), ***n.*** لاڕێیەكە دەگیرێ بۆ نەدانی مزی ڕێگەو كرێی لە پرد پەڕینەوە

**shunt** (shunt), ***v.t. & v.i.*** (١) لە ڕێ لادان؛ لادان؛ خستنەلاوە.
(٢) گۆڕین (شەمەندەفەرێك لە هێڵێكەوە بۆ هێڵێكی تر)؛ خستنەسەر هێڵێكی تر. (٣) گۆڕینی ئەختێك لە تەزووی كارەبا بۆ خولێكی كارەبای تر
(٤) خۆدزینەوە (لە ئەرك)؛ خستنەلاوەو جێبەجێ نەكردن (ئەرك).
***n.*** (١) لادان؛ خستنەلاوە.
(٢) سویچی گۆڕینی شەمەندەفەر لە هێڵێكەوە بۆ هێڵێكی تر؛ گۆڕینێكی وەها.
(٣) هێڵی خولێكی كارەباییە بۆ لادانی ئەختێك لە تەزووی كارەبایی لە خولی سەرەكی.

**shush** (shush), ***interj.*** بێ دەنگ بە!؛ بیبڕەوە!؛ قسە مەكە!؛ دەمت داخە!.
***v.t.*** بێ دەنگ كردن؛ دەم كوت كردن؛ دەم داخستن.

**shut** (shut), ***v.t.*** (١) داخستن (دەرگا، پەنجەرە، پەردە)؛ قفڵدان.
(٢) پێوەدان؛ جووت كردن (دەرگا).
(٣) داخستن (كون)؛ گرتن (كون)؛ كپ كردن.
(٤) چوونەژوورەوەو هاتنەدەرەوە لێ قەدەغەكردن؛ ڕێ لێگرتن.
(٥) لێك نان (دەم، لێو)؛ داخستن (چەتر، دەم).
***v.i.*** داخران.
***adj.*** داخراو (دەرگا، پەنجەرە، پەردە).
***n.*** (١) داخستن؛ كاتی داخستن.
(٢) هێڵی لەحیم كردنی دوو پارچە كانزا؛ شوێنی لەحیم كراو

**shut down,** (١) هێنانە خوارەوەو داخستن (شووشەی پەنجەرە)؛ سەرنانەوە. (٢) داهاتن (شەو)؛ بەرچاوگرتن.
(٣) داخستن یا داخران بۆ سەردەمێك (كارگە، قوتابخانە، دەزگا):
*( to shut down a factory; Many schools have shut down.)*
(٤)[Colloq.]، دوایی پێ هێنان؛ پەككستن؛ كەمكردنەوە.
(٥) پەككەوتن یا لەكاركەوتن (مەكینە، كۆمپیوتەر).
**shut in,** دەورەدان؛ چواردەورگرتن؛ بەرچاوگرتن:
*( a house shut in by trees)*
**shut off,** (١) كوژاندنەوە (چرا، كارەبا).
(٢) گرتنەوە (ئاو)؛ داخستن (ڕێگە).
**shut out,** (١) ڕێی چوونەژوورەوە لێ گرتن (خەڵك، دەنگ)؛ لێ قەدەغەكردن؛ ڕێی بەشداربوون لێ گرتن:
*( to shut out noise, opposition political parties, immigrants, etc.)*
(٢) ڕێ نەدان بە تیپی بەرامبەر بۆ خاڵ گرتن.
**shut up,** (١) هەموو دەرگاو پەنجەرە داخستن:
*( to shut up a house)*
(٢) داخستن (فرۆشگا)؛ هەڵگرتن (دووكان). *( to shut up a shop)* .
(٣) (ا) خستنە شوێنێكی باشەوە بۆ پاراستن.
(ب) كردنە ژوورەوە؛ دەرگا لەسەر داخستن؛ خستنە بەندیخانەوە.
(٤) (ا) دەم كوت كردن؛ بێ دەنگ كردن. (ب) دەم كوت بوون؛ دەم داخستن.
(ج) *( interj.)* ، دەمت داخە!؛ بیبڕەوە!؛ لەوە زیاتر قسە مەكە!.
**shut-down** (shut′doun′), *n.* (١) داخستنی سەردەمی كارگە.
(٢) پەككەوتن (مەكینە)؛ لەكاركەوتنی سەردەمی (كۆمپیوتەر، مەكینە).
**shut-eye** (shut′ī′), *n.* [Slang]. نوستن؛ خەوتن.
**shut-in** (shut′in′), *n.* نەخۆشێكی كەفتەكار؛ نەخۆشی لە جێگەدا كەوتوو.
*adj.* (١) كەفتەكار؛ كەفتە؛ لە جێگەدا كەوتوو. (٢) گۆشەگیر (دەروونناسی).
**shut-off** (shut′ôf′), *n.* (١) وەستێنەر؛ كوژێنەرەوە؛ كلیل یا سویچی كوژاندنەوە یا وەستاندن. (٢) وەستان؛ كوژانەوە؛ گرتنەوە (ئاو).
**shut-out** (shut′out′), *n.* (١) داخستنی كارگە لەلایەن خاوەنەكەیەوە بۆ سەپاندنی مەرجەكانی بەسەر كرێكارەكاندا. (پێشی دەووترێ: "**lockout**").
(٢) (ا) ڕێ نەدان بە تیپی بەرامبەر بۆ خاڵ گرتن (وەرزش).
(ب) یارییەكە كە تیپی بەرامبەر ڕێی نادرێ هیچ خاڵ بگرێ.
**shutter** (shut′ẽr), *n.* (١) داخەر (مرۆڤ، شت).
(٢) دەروازەی پەنجەرە: چوارچێوەیەكە لەودیوی پەنجەرەوە وەك دەرگا وایە كە دادەخرێ ڕووناكی لە پەنجەرەكە دەبڕێ.
(٣) شتی داپۆشەر یا داخەر (پەردە، سەرقاپ، دەرگا ..هتد).
(٤) دەرگای كامێرا: بۆ ڕێ دان بە ڕووناكی یا بەرگرتنی.
*v.t.* داخستن
**shutterbug** (shut′ẽr-bug′), *n.* [Colloq.]. زۆر حەز لە كامێرا كەر
**shuttle** (shut′'l), *n.* (١) مەكۆ (حۆڵایی).
(٢) ئامێری ئەمسەرو ئەوسەر كەر.
(٣) پاس، شەمەندەفەر، یا فڕۆكەیەكە كە هاتوچۆ دەكات لەنێوان دوو شوێنی نەختێك نزیكدا بە ڕێكوپێكیو زوو زوو (٤) ئەمسەرو ئەوسەر كردن؛ هاتوچۆكردن بە ڕێكوپێكیو زوو زوو لەنێوان دوو شوێنی نزیكدا.
*v.t. & v.i.* ئەمسەرو ئەوسەر كردن (پاس، شەمەندەفەر، فڕۆكە، مرۆڤ)؛ هاتوچۆكردن (بەتایبەتی لەنێوان دوو شوێنی نزیكدا).
**shuttle bus,** پاسێكە ئەمسەرو ئەوسەر دەكات لەنێوان دوو شوێنی نزیكدا.
**shuttlecock** (shut′'l-kok′), *n.* (١) تۆپی پەڕ.
(٢) یاری تۆپی پەڕ (بە ڕەكت دەكرێت).
**shuttle train,** شەمەندەفەرێكە ئەمسەرو ئەوسەر دەكات لەنێوان دوو شوێنی نزیكدا.
**shy** (shī), *adj.* (١) شەرمن؛ بە شەرم؛ كەم ڕوو؛ بێ ڕوو.
(٢) سرك. (٣) وورریا؛ بە ئاگا؛ بە گومان؛ گوێ قوڵاغ (مەجاز).
(٤) [Slang]، قەرزار (لە یاری پۆكەردا).
(٥) [Slang]، كەم؛ كورت؛ كورت دەهێنێت؛ كەم دەهێنێت:
*( It's two inches ~ .)*
(٦) كەم بەر (درەخت)؛ بێ پیت؛ كەم پیت.
*v.i.* (١) سڵەمینەوە؛ هەڵسڵەمینەوە؛ ڕاچڵەكین؛ داچڵەكان:
*( The horse shied at the scarecrow.)*
(٢) لاتریسك لێ بەستن؛ خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ دوور گرتن:
*( to ~ away from crowded areas)*
*n.* سڵەمینەوە؛ ڕاچڵەكین؛ داچڵەكان.
-shyly *(adv.).*
**fight shy of,** خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ دوور گرتن؛ توخن نەكەوتن؛ لێ تەكینەوە.
**shy** (shī), *v.t. & v.i.* لابەلا هاویشتن:
*( He shied a stone over the wall.)*
*n.* (١) هاویشتن (بەتایبەتی لابەلا)؛ تێ گرتن؛ فڕێدان.
(٢) [Colloq.]، هەوڵدان؛ تاقیكردنەوە. (٣) [Colloq.]، توانج؛ پلار
**Shylock** (shī′lok′), *n. Also* **Shylok,** خاوەن قەرزێكی بێ بەزەیی دڵڕەقی لە كەسو لە هیچ خۆش نەبووە.
**shyness** (shī′nis), *n.* (١) شەرم؛ شەرمنی؛ كەم ڕوویی؛ بێ ڕوویی.
(٢) سركی.
**shyster** (shī′stẽr), *n.* [Slang], پارێزەرێكی چاوبرسیو بێ ویژدانو سەرچەوتو بە پێچوپەنایە.
**sialagogic** (sī′ə-lə-goj′ik), *adj.* یارمەتی لیك دەردان دەدات.
**sialagogue** (sī-al′ə-gog′), *n.* دەرمانی لیك پێ دەردان.
**siamang** (sē′ə-maŋ′, syä′maŋ), *n.* جۆرە مەیمونێكی گەورەی "سۆمەترە"یە.
**Siamese cat,** پشیلەی سیامی: جۆرە پشیلەیەكی تووك كورتی بۆری چاو شینی سەرو قاچو كلك ڕەشە.
**Siamese twins,** هاوزای سیامی؛ هاوزای پێكەوەنووساو.
**sib** (sib), *n.* (١) (ا) خزم؛ خزمێك. (ب) خزمان؛ خزمو كەسوكار؛ خزموخوێش. (٢) **sibling** .
*adj.* (١) خزم؛ خزمی هاوخوێنی.
(٢) [Rare]، نزیك؛ پەیوەندیدار.
**Siberian** (sī-bêr′i-ən), *adj.* سیبریەیی؛ تایبەتی بە سیبریە.
*n.* هاووڵاتییەكی سیبریە؛ كەسێكی سیبریەیی.
**sibilance** (sib′'l-əns), *n. Also* **sibilancy,** (١) درانە دەم یەك (دەنگناسی). (٢) دەنگی دراوە دەم یەك وەك: (سس، شش)؛ فیشكە؛ فیكە.
**sibilant** (sib′'l-ənt), *adj.* فیشكە؛ لە فیشكە چوو؛ فیشكەكەر.
*n.* دەنگی فیشكەیی یا نیشانەی دەنگێكی وەها (وەك: **ch, z, sh, s** ).
**sibilate** (sib′'l-āt′), *v.t. & v.i.* فیشكەكردن؛ وەك فیشكە بێژان؛ بە فیشكە ووتن.
-sibilation *(n.).*
**sibling** (sib′liŋ), *n.* خوشك یا برا؛ خوشكو برا؛ خوشك؛ برا.
**sibyl** (sib′'l), *n.* (١) ژنی پێشبین (ئەفسانەی یۆنانو ڕۆمان)؛ ژنی جادووگەر. (٢) ژنی فاڵچی یا فاڵگر؛ ئافرەتی پێشبین یا پێشزان؛ جادووگەر (ژن).
**sibylic, sibyllic** (si-bil′ik), *adj.* = **sibylline.**
**sibylline** (sib′'l-īn′, sib′'l-in), *adj.* (١) تایبەتی بە جادووگەر.
(٢) پێشبین؛ هی جادووگەری؛ پێشزان؛ هی پێشبینی.
**sic** (sik), *adv.* وەهایە؛ وایە؛ خۆی بەم جۆرەیە: نیشانەیەكی چاپەمەنییە لەناو كەوانەی گۆشەداردا دەنووسرێ لەدوای ڕستەیەك یا ووتەیەكی هەڵەی لە سەرچاوەیەكەوە وەرگیراوەوە بەمانای "ئەگەرچی ئەم ڕستەیە هەڵەیش بێ لە دەقەكەیدا وایەو هیچ دەستكاری نەكراوە".
**sic** (sik), *v.t. Also* **sick,** (١) سەگ تێكردن؛ كس كس لە سەگ كردن؛ هاندان. (٢) پەلاماردان.

**sicative** (sik′ə-tiv), ***n.*** ماددەی ووشککەرەوەی بۆیەو مەرەکەب؛ ووشککەرەوە.
***adj.*** ووشککەرەوە.
**Sicilian** (si-sil′i-ən, si-sil′yən), ***adj.*** تایبەتی بە دوورگەی سیسیلی و خەڵکەکەی؛ سیسیلیایی.
***n.*** (١) هاوولاتی‌یەکی دوورگەی سیسیلی.
(٢) شێوە زمانی ئیتاڵی دوورگەی سیسیلی.
**sick** (sik), ***adj.*** (١) نەخۆش؛ بیمار؛ خەستە؛ دەردەدار؛ ناساغ.
(٢) خەریکە دەرشێتەوە؛ دڵ تێکەڵهاتوو؛ هێڵنجدەر.
(٣) تایبەتی بە نەخۆش یا نەخۆشی: ***( ~ leave )*** .
(٤) زۆر پەست؛ پەرێشان؛ دڵتەنگ؛ تێکچوو.
(٥) لەبەرچاوکەوتوو (لەبەر زۆری)؛ بێزار:
***( to get ~ of a food, place, activity, person, etc.)***
(٦) پەککەوتوو (کەشتی)؛ پێویستی بە چاك کردنەوەیە.
(٧) بەپەرۆش؛ بەتاسەوە؛ بیری دەکات: ***( He is ~ for the hills.)*** .
(٨) ڕەنگ زەرد؛ زەردهەڵگەڕاو؛ ڕەنگ پەڕیو؛ بێ ڕەنگ.
(٩) مێشك نەخۆش؛ شێت.
(١٠) (ا) پیتی نەماوە (زەوی)؛ بەکەڵکی هەندێ کشتوکاڵ نەماوە:
***( wheat- ~ soil)***
(ب) جانەوەری گەردبین تێی داوە (زەوی): ***( a ~ field)*** .
***n.*** **( the ~ ),** نەخۆشان؛ نەخۆشەکان؛ نەخۆش گەل.
**sick** (sik), ***v.t. Also*** sic, (١) پەلاماردان (سەگ)؛ ڕاونان.
(٢) سەگ تێکردن؛ کس کس لێ کردن: ***( He ~ed his dog on us.)*** .
**sick bay,** خەستەخانەی کەشتی.
**sick-bed** (sik′bed′), ***n.*** جێگەی نەخۆش.
**sick call,** (١) ڕیزبوونی ڕۆژانەی ئەو سەربازانەی پێویستی‌یان بە دەرمان کردنە. (٢) بانگەوازی ئەم ڕیزبوونە.
**sicken** (sik′'n), ***v.i.*** (١) نەخۆش کەوتن.
(٢) وەڕس بوون؛ بێزاربوون؛ دڵی لێ تێکەڵهاتن.
***v.t.*** (١) نەخۆش خستن.
(٢) زۆر پەستکردن؛ دڵ تێکەڵهێنان: ***( Cruelty ~s me.)*** .
**sickening** (sik′'n-iŋ), ***adj.*** (١) نەخۆشخەر؛ دڵ تێکەڵهێنەر؛ هێڵنج پێدەر (٢) پیس و بۆگەن؛ زۆر پەستکەر؛ قێزهێنەرەوە.
**-sickeningly** ***( adv.).***
**sick headache,** = migraine.
**sickish** (sik′ish), ***adj.*** (١) نەختێك نەخۆش؛ نەختێك دڵ تێکەڵهاتوو.
(٢) نەختێك دڵ تێکەڵهێنەر یا قێزهێنەرەوە؛ نەختێك پەستکەر.
**sickle** (sik′'l), ***n.*** (١) داس؛ داسوولکە.
(٢) [S-]، شەش ئەستێرەن لە شێوەی داسدا لە کەلووی شێر (ئەستێرەوانی).
**sick leave,** ووچانی ناساغی؛ پشووی ناساغی.
**sicklebill** (sik′'l-bil′), ***n.*** دەنووك داس: هەر باڵندەیەکە دەنووکی نوشتاوە بێت وەك داس.
**sickle feather,** پەڕی داسی: پەڕێکی درێژو نوشتاوەی کلکی کەڵەشێرە.
**sickly** (sik′li), ***adj.*** (١) هەمیشە نەخۆش؛ نەخۆش؛ دەردار؛ لاواز.
(٢) هی نەخۆشی‌یە؛ لە نەخۆشی‌یەوەیە: ***( a ~ complexion )*** .
(٣) ناساز: ناسازگار: ***( a ~ climate)*** .
(٤) (ا) ڕەنگ زەردو لاواز؛ ڕەنگ پەڕیو؛ بێ ڕەنگ.
(ب) کوڵۆڵ؛ داماو؛ کەساس؛ مەراقاوی: ***( a ~ smile )*** .
(ج) لاواز؛ جیقن: ***( a ~ plant )*** .
(٥) (ا) دڵ تێکەڵهێنەر؛ قێز هێنەرەوە؛ پیس و بۆگەن: ***( a ~ odor )*** .
(ب) لە ڕادە بەدەر بەسۆز؛ سۆز پەرست بەشێوەیەکی بێ تام و منداڵانە.
**-sickliness** ***(n.).***
**sickness** (sik′nis), ***n.*** (١) نەخۆش کەوتن؛ ناساغی؛ دەردەداری؛ بیماری. (٢) نەخۆشی؛ دەرد. (٣) دڵ تێکەڵهاتن؛ هەست بە ڕشانەوە کردن.
**sick-room** (sik′rōōm′, sik′room′), ***n.*** ژووری نەخۆش.

**sic passim** (sik pas′im), [L.], وەهایە لە هەموو شوێنێکدا (پەرتووك، ووتار...هتد). (نیشانەیەکی چاپەمەنی یا ڕوون کردنەوەیە بەمانای ئەوەی کە فلان ووتە بە هەمان شێوە بەکارهێنراوە لە سەرانسەری نووسراوێکدا).
**siddur** (sid′oor), ***n.*** پەرتووکی نزاو نوێژی جوولەکە.
**side** (sīd), ***n.*** (١) لا (لەش)؛ لا کەلەکە؛ لاقەد؛ کەلەکە؛ لاتەنیشت:
***( I usually sleep on my left ~ .)***
(٢) (ا) لا؛ دیو. (ب) تەنیشت؛ تەك.
(٣) لا (ئەندازە)؛ پەل: ***( A square has four ~s.)*** .
(٤) دیو (کاغەز، کاڵا، بەرگ)؛ ڕوو؛ ڕووکار:
***( Write on one ~ of the paper.)***
(٥) ڕوو؛ بار: ***( the cruel ~ of him)*** .
(٦) لاقەد یا لای کەشتی. (٧) قەد پاڵ؛ پاڵ (گرد، شاخ)؛ قەد؛ لێژایی
(٨) گوێ (ڕووبار، دەریاچە، ئەستێل)؛ قەراغ؛ کەنار؛ ڕۆخ.
(٩) لایەن:
***( Explain your ~ of the argument.; to take someon's ~ )***
(١٠) لا (ناکۆکی). (١١) لا (بنەچە).
(١٢) [British Slang]، لووت بەرزی؛ فیز.
***adj.*** (١) لاتەنیشتی؛ لایی:
***( a ~ door, entrance, etc.)***
(٢) لابەلا؛ لەلاوە؛ بە تیلەی چاو: ***( a ~ glance, view, etc.)***
(٣) ناسەرەکی؛ ناگرنگ: ***( a ~ issue )*** .
(٤) زیادە؛ زیاد لە شتە سەرەکی‌یەکەیش: ***( a ~ benefit)***
(٥) لا (لا ڕێ، لا کۆڵان): ***( a ~ street; a ~ road )*** .
***v.t.*** (١) لا بۆ کردن؛ لا بۆ درووستکردن:
***( to ~ a barn)***
(٢) [Colloq.]، خستنە لاوە؛ فڕێدانە لاوە.
**on the side,** [Colloq.], (١) لەلاوە؛ جگە لە پیشە سەرەکی‌یەکەی:
***( He also earns some money on the side.)***
(٢) جگە یا زیاد لە شتە سەرەکی‌یەکە؛ لەلاوە.
**side against,** دژ وەستان؛ لایەن نەگرتن.
**side by side,** پێکەوە؛ شان بەشانی یەك؛ لەگەڵ یەکدا.
**side with,** لایەن گرتن؛ لایەنگیری کردن؛ لەسەر کردنەوە؛ پاڵپشتی کردن
**take sides,** لایەنی لایەك گرتن؛ لایەنگیری لایەك کردن.
**this side (of),** نەختێکی گەڕاوەتەوە لە؛ چەپی گەڕاوەتەوە لە:
***( this side of madness)***
**side arms,** چەکی کەمەر (دەمانچە، شیر؛ نێزە)؛ چەکی لاتەنیشت.
**side-board** (sīd′bôrd′, sīd′bōrd′), ***n.*** (١) دۆڵابی کەوچك و چەتاڵ و قاپی نان خواردن. (٢) چەملەغ.
**side-burns** (sīd′būrnz′), ***n. pl.*** لاجانگ.
**side-car** (sīd′kär′), ***n.*** (١) گالیسکەیەکی یەك کەسی‌یە بە تەنیشت ماتۆڕسکیلەوە. (٢) جۆرە خواردنەوەیەکی سەرخۆشکەری تێکلاوە.
**sided** (sīd′id), ***adj.*** ئەوەندە لایی؛ ئەوەندە لای هەیە:
***( four- ~ )***
**side dish,** خواردەمەنی ناسەرەکی یا لەلاوە (کە لەگەڵ خواردەمەنی‌یە سەرەکی‌یەکەدا پێشکەش دەکرێ).
**side effect,** ئەنجامی لابەلایی یا ناسەرەکی ناپەسەند (هی دەرمانێك)
**side glance,** (١) سەیرکردنێکە بە تیلەی چاو.
(٢) ئاوهێنانێکی ناڕاستەوخۆ.
**side-kick** (sīd′kik′), ***n.*** [Slang], هاوڕێی گیانی بە گیانی؛ هاودەم.
**side light,** (١) ڕووناکی لەلاوە هاتوو.
(٢) دەنگوباسی لابەلایی یا ڕێکەوت. (٣) پەنجەرە یا کونی لا دیوار.
(٤) یەکێکە لە دوو چرای لاتەنیشتی کەشتی (یەکێکیان سوورەو یەکێکیان

سەوز.

**side-line** (sīd′līn´), *n. Also* **side line,** (١) هێڵی لاتەنیشت:

(أ) هێڵی سنووری یاریگا. (ب) (*pl.*) ناوچەی دەوروپشتی ئەم هێڵی سنوورە (کە سەیرکەرانی یاری تیا دادەنیشن یا دەوەستن):

*( to watch from the ~s)*

(ج) هێڵی لقی ( ڕێگەی شەمەندەفەر، بۆری... هتد). (د) پەتی پێوەندی ووڵاخ.

(٢) چەند فرۆتەنییەکە کۆمپانیایەک دەیفرۆشێ لەسەرباری فرۆتەنییە سەرەکییەکانیەوە. (٣) نیشێکە کە کەسێك لە سەرباری پیشەکەیەوە دەیکات.

***v.t.*** کردنەدەرەوەی یاریگا؛ قەدەغەلێکردنی یاری:

*( He was ~d by his injury.)*

**sideliner** (sīd′līn´ẽr), *n.* سەیرکەر لە دوورەوە؛ کەسێکە کە هەر لە دوورەوە تەماشا دەکات و بەشداری شت نابێ و ناچێتە ناو شتەوە.

**sideling** (sīd′liŋ), *adj.* (١) لابەلا؛ خوار؛ لار. (٢) لێژ.

***adv.*** بە لابەلایی؛ بە خواری.

**sidelong** (sīd′lôŋ´), *adv.* (١) بە لابەلایی؛ بە خواری.

(٢) لەسەر لا؛ بە لادا.

***adj.*** (١) لێژ؛ بەرەو خوارکە. (٢) لابەلا؛ خوار؛ بە تیلەی چاو.

(٣) نا ڕاستەوخۆ (تێبینی).

**side-man** (sīd′mən), *n.* ئەندامی تیپێکی مۆسیقای جاز.

**side-piece** (sīd′pēs´), *n.* پارچەی تەنیشت؛ لا پارچە.

**sidereal** (sī-dêr′i-əl), *adj.* (١) ئەستێرەیی؛ تایبەتی بە ئەستێرەو کۆئەستێرە. (٢) بەپێی سووڕانەوە دەپێورێت؛ بەهۆی ئەستێرەوە پێوراو (کات). *( ~ time)*.

(٣) بەگوێرەی ئەستێرە؛ دەربارەی ئەستێرە.

**sidereal day,** ڕۆژی ئەستێرەیی (بریتییە لە ٢٣ سات و ٥٦ خولەك و ٤.٠٩ چرکە)

**sidereal hour,** ساتی ئەستێرەیی (بریتییە لە بیست و چوار یەکی ڕۆژی ئەستێرەیی).

**sidereal month,** مانگی ئەستێرەیی (بریتییە لە ٢٧ ڕۆژ و ٧ سات و ٤٣ خولەك و ١١.٥ چرکە).

**sidereal time,** کاتی ئەستێرەیی: کاتی پێوراو بەپێی ڕۆژی ئەستێرەیی

**sidereal year,** ساڵی ئەستێرەیی: ئەو کاتەی کە پێویستە بۆ یەك سووڕانەوەی تەواوی زەمین بە دەوری خۆردا بەپێی ئەستێرە ئەبزۆکەکان (کە بریتییە لە ٣٦٥ ڕۆژ و ٦ سات و ٩ خولەك و ٩.٥٤ چرکە).

**sidero-** (sid′ẽr-ō, sid′ẽr-ə), *Also* **sider-,** پێشگرێکە بەمانای: ئاسن *( siderolite )* .

**sidero-** (sid′ẽr-ō, sid′ẽr-ə), *Also* **sider-,** پێشگرێکە بەمانای: ئەستێرە: *( siderostat )* .

**siderosis** (sid´ə-rō′sis), *n.* هەوکردنی سی: ئەخۆشییەکی سییە لە هەڵمژینی توزی ئاسنەوە تووش دەبێ.

**siderostat** (sid′ẽr-ō-stat´), *n.* ئاوێنەیەکە لەگەڵ ئەستێرەیەکدا دەسووڕێتەوە بۆ شەوق دانەوە بۆ سەر تەلیسکۆپێك.

**sidesaddle** (sīd′sad´'l), *n.* زینی ژنانە: بۆ هەردوو لاق خستنە دیوێکی ووڵاخەکە (بۆ ئافرەتی تەنوورە لەبەر).

**side show,** (١) پیشاندانێکی لەلاوە: پیشاندانێك یا نواندنێکی ناسەرەکی و زیادەیە وە لە سەرباری نواندنە سەرەکییەکە (بەتایبەتی لە "سێرك" دا). (٢) ڕووداوێکی ناسەرەکی و لەلاوە (هەندێ جار بۆ خەڵفاندن).

**sideslip** (sīd′slip´), *v.i.* خلیسکان بە لایەکدا.

***n.*** (١) خلیسکان بە لادا (ئۆتۆمبیل)؛ خلیسکانی تەنیشتی.

(٢) فڕین بە لایەکدا و نزم بوونەوە لە هەمان کاتدا (فڕۆکە).

**sidesplitting** (sīd′split´iŋ), *adj.* شەق پێ بەر لە پێکەنیندا.

**side-step** (sīd′step´), *v.i.* (١) هەنگاونان بە لایەکدا.

(٢) لێ ڕاکردن (بڕیار، کێشە)؛ خۆ لێ دزینەوە؛ خۆ لێ لادان.

***v.t.*** (١) خۆلادان (بۆکسبازی)؛ لەبەردەم لاچوون:

*( to ~ a blow)*

(٢) لێ ڕاکردن؛ خۆ لێ دزینەوە؛ خۆ لێ لادان:

*( to ~ an issue, awkward questions, etc.)*

**side step,** (١) هەنگاوی لایی یا تەنیشتی (بۆکسبازی).

(٢) پلەی لایی؛ پلەی تەنیشتی.

**side stroke,** مەلەی لەسەر لا.

**sideswipe** (sīd′swīp´), *v.t.* لێدان لەکاتی بە تەنیشتدا ڕۆیشتن؛ لە تەنیشت دان (لەکاتی بەلادا ڕۆیشتندا): *( to ~ a car)* .

***n.*** لێدانی تەنیشتی لە کاتی بەلادا ڕۆیشتندا.

**sidetrack** (sīd′trak´), *v.t. & v.i.* (١) گوێزین یا لابردن بۆسەر هێڵی نا سەرەکی (شەمەندەفەر).

(٢) (ا) لە باس لادان؛ لە ڕێ لادان؛ سەرنج ڕاکێشان و خەڵفاندن.

(ب) دواخستن (باس، بڕیار)؛ لێ ڕاکردن؛ خۆ لێ لادان؛ خۆ لێ دزینەوە.

(٣) پلە نزم کردنەوە.

***n.*** هێڵی تەنیشتی یا ناسەرەکی (شەمەندەفەر).

(پێشی دەووترێ: "siding").

**sidewalk** (sīd′wôk´), *n.* شۆستە؛ پیادەڕێ (لەمبەرو ئەوبەری شەقامدا).

**sideward** (sīd′wẽrd), *adj.* تەنیشتی؛ لایی؛ بەرەو تەنیشت.

***adv.*** لە تەنیشتەوە؛ بەرەو تەنیشت؛ لایی؛ لەلاوە.

**sidewards** (sīd′wẽrdz), *adv.* = **sideward.**

**sideway** (sīd′wā´), *adj. & adv.* = **sideways.**

***n.*** = **byway.**

**sideways** (sīd′wāz´), *adv.* (١) لەلاوە؛ لە تەنیشتەوە؛ لە لایەکەوە؛ بەرەو لایەك. (٢) لایەکی ڕووی کردووەتە پێشەوە (نەك پێشەکەی)؛ لایەکی بەرەو پێشەوەیە. (٣) لابەلا؛ بەلادا؛ لەسەر لا.

***adj.*** بەرەو تەنیشت؛ لە تەنیشتەوە؛ لە لاوە.

**side-wheel** (sīd′hwēl´), *adj.* ڕەوڕەوەی سەول لێدان بە تەنیشتییەوەیە (بەلەمی هەڵم). (ووشەی "paddle wheel " ببینە)

**side-wheeler** (sīd′hwēl´ẽr), *n.* بەلەمێکی هەڵمە ڕەوڕەوەی سەول لێدان بەم دیو و ئەودیوییەوە بێ.

**side wind,** (١) بای تەنیشتی.

(٢) هۆی ناڕاستەوخۆ؛ ڕێی لابەلایی:

*( The announcement reached us by a ~.)*

**side-winder** (sīd′wīn´dẽr), *n.* (١) جۆرە مارێکی زەنگوڵەداری ژەهراوی بچووکە. (٢) [Colloq.]، مستەکۆڵەیەکی توندی تەنیشتی

**sidewise** (sīd′wīz´), *adj. & adv.* = **sideways.**

**siding** (sīd′iŋ), *n.* (١) تەختەداری دیوی دەرەوەی دیواری خانووی دارین. (٢) هێڵێکی شەمەندەفەری کورتە بەستراوە بە هێڵێکی سەرەکییەوە. (پێشی دەووترێ "sidetrack" ).

**sidle** (sīd′'l), *v.i.* لەسەر لا ڕۆیشتن بە ترسەوە، بە دزییەوە یا بە شەرمەوە.

***n.*** ڕۆیشتن لەسەر لا بە ترسەوە، بەدزییەوە، یا بە شەرمەوە.

**siege** (sēj), *n.* (١) ئابڵووقە (شار، قەڵا)؛ گەمارۆ؛ ئابڵووقەدان؛ گەمارۆدان: *( The city is under ~.)* .

(٢) هەوڵێکی بەردەوامی بێ کۆڵ دان (بۆ سەرکەوتن بەسەر شتێکدا).

(٣) ماوەیەکی درێژ خایەن (بەتایبەتی هی ناخۆشی و دژواری و نەخۆشی)

(٤) [Obs.]، (ا) کورسی. (ب) تەختی پاشایی.

(٥) [Obs.]، پلەوپایە؛ پلە.

***v.t.*** ئابڵووقەدان (شار، قەڵا)؛ گەمارۆدان.

**lay siege to,** ئابڵووقەدان؛ گەمارۆدان.

**sienna** (si-en′ə), *n.* (١) خاکێکی قاوەیی زەردکارە ئاسن و مەنگەنیزی تێدایە. (٢) بۆیەیەکی قاوەیی سوورکارە لە سووتاندنی ئەم خاکەوە وەردەگیرێ (پێی دەووترێ "burnt sienna" ).

(٣) ڕەنگی ئەم خاکە یا ئەم بۆیەیە.

**sierra** (si-er′ə), ***n.*** (١) ڕیزه شاخێكی تەوقە سەر كەلە وەك دانی مشار. (٢) جۆرە ماسییەكی دەریاییە.

**siesta** (si-es′tə), ***n.*** سەرخەوی پاش نیوەڕۆ؛ سەرخەو شكاندنی پاش نیوەڕوان.

**sieve** (siv), ***n.*** بێژنگ؛ هێلەك؛ كەو.

***v.t. & v.i.*** بێژانەوە؛ لەبێژنگدان؛ تەتەڵەكردن.

**sieve tube,** بۆری هێڵەكی بۆرییەكە لە قەدی دارو درەختدا؛ دیوارەكەی لە شانەی تەنك و كون كون پێك هاتووە خواردەمەنی دەبات.

**sift** (sift), ***v.t.*** (١) بێژانەوە؛ لەبێژنگدان؛ تەتەڵەكردن.

(٢) بەسەردا بێژانەوە: ***( to ~ sugar on to the cake)*** .

(٣) پشكنین؛ لێ وردبوونەوە؛ تاقیكردنەوە؛ تێڕوانین؛ پیاگەڕان:

***( to ~ evidence)***

(٤) پاك‌وبێس كردن؛ پوختەكردن؛ لێك جیاكردنەوە:

***( He ~ed fact from fiction.)***

***v.i.*** (١) بێژانەوە؛ لەبێژنگدان

(٢) پێدا ڕۆیشتن (هەر وەك بە بێژنگدا):

***( the soldiers, ~ing through the forest)***

(٣) ( ~ through )، بەووردی تێڕوانین؛ پشكنین؛ باش لێ وردبوونەوە؛ پێدا گەڕان:

***( The rescue workers ~ed through the rubble looking for survivors.)***

**sifter** (sif′tēr), ***n.*** هێلەك

***( a flour- ~ )***

(ووشەی "sieve" یش ببینە).

**siftings** (sif′tiŋz), ***n.pl.*** (١) شتی بێژراوە؛ شتی لەبێژنگدراو.

(٢) سەركۆزەر؛ كۆزەر؛ كۆتەڵ.

**sigh** (sī), ***v.i.*** (١) هەناسە (ی سارد) هەڵكێشان؛ ئاخ و ئاخ هەڵكێشان؛ ئاهی سارد هەڵكێشان. (٢) دەنگێكی وەك ئاخ و داخ لێوە هاتن؛ شنە كردن؛ ووژەووژ هاتن؛ یا لوورەلوور كردنی با بەناو درەختدا:

***( trees ~ing in the wind)***

(٣) ( ~ for )، ئاخ و داخ بۆ هەڵكێشان؛ بۆ بە تاسەوە بوون؛ ئاواتە خواز بوون بۆ.

***v.t.*** (١) هەناسە (ی سارد) هەڵكێشان؛ ئاخ و داخ هەڵكێشان.

(٢) بە هەناسەی سارد هەڵكێشانەوە كات بردنە سەر:

***( He ~ed his youth away.)***

(٣) [Rare]، ئاخ و داخ بۆ هەڵكێشان؛ شین بۆ كردن؛ بۆ لاواندنەوە.

***n.*** هەناسەی سارد؛ ئاهی سارد؛ كسپەی دەروون؛ ئاه؛ ئاخ؛ ئاخ و داخ.

**sight** (sīt), ***n.*** (١) (ا) دیمەن. (ب) دیمەنێكی جوان و ئەنتیكە؛ دیمەنی سەرنجڕاكێش ***( The dawn was a ~ to behold.)*** .

(ج) (.pl) دیمەنێك یا شتێكە كە شایستەی بینین بێ:

***( the ~s of the city)***

(٢) بینین. (٣) پشكنین؛ تێ ڕوانین؛ لێ وردبوونەوە.

(٤) تەماشا؛ سەیر؛ سەیركردن؛ تەماشاكردن.

(٥) نیشان لێ گرتنەوە؛ تێڕوانین بە ئامێر. (٦) بینایی؛ دیدە؛ هەستی بینین.

(٧) هاتنە بەرچاو؛ هەستپێكردن؛ بینین بە مێشك.

(٨) مەودای بینایی. (٩) (ا) ڕا. (ب) [Obs.]، ڕێ بەدییی.

(١٠) چوكڵە نیشانی تفەنگ و دەمانچە (بۆ نیشان گرتنەوە).

(١١) [Colloq.]، دیمەنێكی سەیرو ناشرین:

***( Our house was a ~ after the party.; She is a ~ without her makeup.)***

(١٢) [Colloq.]، زۆر (ژمارە، هەند).

***v.t.*** (١) تێڕوانین (بە ئامێر)؛ چاودێری كردن؛ سەیركردن:

***( to ~ a target)***

(٢) بەدی كردن؛ چاوپێكەوتن؛ بینین.

(٣) نیشان لێ گرتنەوە (بەهۆی چوكڵە نیشانەوە).

(٤) چوكڵە نیشان خستنەسەر؛ ئامێری بینین (وەك دووربین) خستنەسەر.

(٥) چوكڵە نیشان چاكردن یا ڕێكخستن (تفەنگ، دەمانچە).

***v.i.*** (١) نیشان لێ گرتنەوە (بەهۆی چوكڵە نیشانەوە).

(٢) بە ووردی سەیركردن.

a sight for sore eyes (or for the gods), [Colloq.], كەسێك یا شتێكە زۆر پێی خۆشحاڵ بیت بە بینینی.

at first sight, هەر لە یەكەم چاوپێكەوتنەوە؛ تەنیا بە چاوپێكەوتنێك.

at (or on ) sight, (١) هەر كە بینرا؛ كوتوپڕ كە بینرا.

(٢) هەر كە داوا كرایەوە (قەرز، بازرگانی).

catch sight of, (١) بەدی كردن؛ بینین. (٢) سەیركردن بە پەلە.

know (a person) by sight, هەر بە دەموچاو یا ڕووخسار ناسین.

lose sight of, (١) لە چاو ون بوون. (٢) لەبیرچوونەوە؛ ڕەچاو نەكردن؛ لێك نەدانەوە؛ بایەخ پێ نەدان.

out of sight, (١) لەبەرچاو نییە؛ نابینرێ.

(٢) دوور؛ دەس نایگاتێ.

(٣) [Colloq.]، زۆر بەرز (نرخ، پلەی چاكی)؛ هیچ نایگاتێ؛ دەستی ناگاتێ

***( Prices are out of sight.)***

out of sight, out of mind, ئەوی لەبەر چاو نەما نامێنێ لە یاد؛ ئەوی لەبەر چاوان نەمێنێ لەبەر دڵانیش نامێنێ.

sight unseen, بەبێ بینینی شتەكە پێشەكی.

**sight draft,** چەكێك یا حەوالەیەكە كە هەر پێشكەش كرا دەبێ بدرێ.

**sighted** (sīt′id), ***adj.*** بینایی دار بە جۆرێكی تایبەتی:

***( far- ~ ; near- ~ )***

**sightless** (sīt′lis), ***adj.*** (١) كوێر. (٢) نەبینراو

-sightlessly ***(adv.)***; sightlessness ***(n.)***.

**sightly** (sīt′li), ***adj.*** (١) جوان؛ دڵگیر.

(٢) بەسەر دیمەنێكی جوانا دەڕوانێ.

-sightliness ***(n.)***.

**sight-seeing** (sīt′sē′iŋ), ***n.*** گەڕان بەناو شاردا بۆ بینینی دیمەنی جوان و شوێنی خۆش و ئەنتیكە.

***adj.*** تایبەتی بە گەڕانی ناو شار بۆ بینینی دیمەنی جوان و شوێنی خۆش و ئەنتیكە.

**sight-seer** (sīt′sē′ēr), ***n.*** گەشتكەرێكە كە بەناو شاردا دەگەڕێ بۆ بینینی دیمەنی جوان و شوێنی خۆش و ئەنتیكەی شارەكە.

**sigil** (sij′əl, sig′əl), ***n.*** (١) مۆر؛ دامغە.

(٢) نیشانەیەكە كە گوایە هێزێكی سەرناسا و جادوویی هەیە (جادووگەری؛ ئەستێرەوانی).

**sigill** (sij′əl, sig′əl), ***n.*** مۆر؛ دامغە.

**sigma** (sig′mə), ***n.*** هەژدەهەمین تیپی ئەلف‌وبێی یۆنانییە بەرامبەری تیپی " S "ی ئینگلیزییە.

**sigmate** (sig′māt), ***adj.*** لە تیپی " S " دەچێت.

**sigmoid** (sig′moid), ***adj.*** (١) لە تیپی " S " دەچێت.

(٢) هی "sigmoid flexture".

**sigmoid flexture,** (١) دوا پێچی ڕیخۆڵە گەورە (پێش گەیشتنی بە كۆم). (٢) پێچێكی وەك تیپی "S". (زیندەوەرزانی).

**sign** (sīn), ***n.*** (١) نیشانە:

***( A black arm band is a ~ of mourning)***

(٢) نیشانە؛ هێما: ***( A nod is a ~ of approval.)*** .

(٣) نیشانە: ***( The ~ " ? " indicates a question.)*** .

(٤) نیشانە؛ ئاگاداری؛ نیشانەی بلاونامە؛ درووشم؛ نیشانەدەر.

(٥) شوێن پێ؛ جێ شوێن؛ نیشانەی بوونی شتێك یا زیندەوەرێك لە شوێنێكدا (وەك پشقڵ، شوێن پێ... هتد): ***( Deer ~s were plentiful.)***

(٦) نیشانە: ***( He showed no ~ of friendship.)*** .

(٧) (ا) ڕوودانێكی سەرناسایی (وەك "موعجیزە").

(ب) نیشانەی ڕوودانی دواڕۆژ؛ نوقلانە.
(٨) یەکێک لە دوانزە کەلوو، برج، یا چەرخەکان (ئەستێرەوانی).
(٩) نیشانەی نەخۆشی.
*v.t.* (١) نیشانەی خاچ لە خۆ دان؛ نیشانەی خاچ لێدان بۆ پیرۆزکردن.
(٢) ئیمزا کردن؛ مۆر کردن؛ پەنجە پیانان؛ سم پیانان.
(٣) (ا) قۆنتەرات لەگەڵ کردن؛ بەکرێ گرتن (بە ئیمزا کردنی قۆنتەراتێک):
*( He ~ed a new player.)*
(ب) (on ) ئیش بۆ خۆ دۆزینەوە بە قۆنتەرات ئیمزاکردن.
(٤) نیشاندان؛ دەربڕین بە نیشان:
*( He ~ed his approval with a nod.)*
*v.i.* (١) ئیمزاکردن؛ مۆرکردن؛ پەنجە پیانان.
(٢) نیشانەکردن؛ پیشاندان بە نیشانە
**sign away** (or over), پێدان بە ئیمزاکردن؛
پێ بەخشین بە مۆرکردن.
*( He signed his house away* (or over) *to his heirs.)*
**sign off,** (١) دوایی پێ هێنانی بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن
(لە کۆتایی ڕۆژدا). (٢) [Slang]، دەم داخستن؛ ئیتر قسە نەکردن؛
قسە وەستان.
**sign on,** بەکرێ گرتن (بە قۆنتەرات ئیمزاکردن)؛
ئیش پێدان (یا بۆ خۆ دۆزینەوە)و قۆنتەرات ئیمزا کردن:
*( They signed him on as a foreman.;*
*I signed myself on as a field hand.)*
**sign up,** (١) ناوی خۆ نووسین بۆ سەربازی.
(٢) ناوی خۆ نووسین لەسەر لیستەیەک (بۆ کردنی کارێکی خۆویست).

**signal** (sig′n'l), *n.* (١) نیشانە. (٢) بانگەواز؛ ئاگاداری.
(٣) نیشانەی ئاگاداری، مەترسی، فەرمان... هتد:
*( A red light is a stop ~ .)*
(٤) نیشانەی ئەلەکترونیکی یا ئەلەکتریکی.
*adj.* (١) دیار؛ سەرنج ڕاکێش؛ دەرکەوتوو.
(٢) بۆ نیشانە یا نیشانە پێدان بەکارهێنراو.
*v.t.* (١) نیشانە پێدان؛ پێ ڕاگەیاندن بە نیشانە یا هێما؛
بە نیشانە پێ وتن: *( He ~ed his men to turn back.)*
(٢) بە نیشانە دەربڕین. (٣) وا گەیاندن؛ نیشانەی ئەوە بوون:
*( His death ~ed the end of an era.)*
*v.i.* نیشانەدان؛ بە نیشانە ڕاگەیاندن.
-**signaler; signaller** *(n.).*

**signalize** (sig′n'l-īz′), *v.t.* (١) جیاکردنەوە؛ دەرخستن بە گەورەیی.
(٢) پیشاندان بە ڕوونی؛ سەرنج بۆ ڕاکێشان.

(٤) چرای ئەلەکتریکی هاتوچۆی ئوتومبیل دانان لەسەر ڕێ.

**signally** (sig′nəl-i), *adv.* بە دەرکەوتوویی؛ بە دیاری؛
بە جۆرێ کە سەرنج ڕاکێشێ.

**signalman** (sig′n'l-man′, sig′n'l-mən), *n.* نیشاندەر
(هێڵو ئێسگەی شەمەندەفەر)؛ کرێکاری نیشاندەر.

**signalment** (sig′n'l-mənt), *n.* نیشانە هەڵدانی ڕوخسار
(هی کەسێک کە پۆلیس بە دوایا بگەڕێ).

**signatory** (sig′nə-tôr′i, sig′nə-tō′ri), *adj.* ئیمزاکەر
(بەتایبەتی هی پەیمان) *( ~ powers)*
*n.* وڵات یا نوێنەری ئیمزاکەر (بەتایبەتی هی پەیمانێک لەگەڵ وڵاتانی تر یا
نوێنەرەکانیاندا).

**sinature** (sig′nə-chēr), *n.* (١) ئیمزا. (٢) ئیمزا کردن.
(٣) نیشانەی تایبەتی؛ نیشانەی تایبەخۆ. (٤) نیشانە (مۆسیقا).
(٥) ئەو بەشەی ڕەچەتەیە کە پزیشک ئامۆژگاری تێدا دەنووسێ دەربارەی
بەکارهێنانی دەرمانەکەوە.
(٦) ئاواز یا نیشانەی تایبەتی بە بەرنامەیەکی ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن.
(٧) نیشانە (چاپەمەنی): بریتییە لە ژمارەیەک یا پیتێک کە لە لاخوارووی یەکەم
لاپەڕەی بەشەکانی کتێبێک چاپ دەکرێ بۆ ڕێک خستنی لە بەرگ تێ گرتندا.

**signboard** (sīn′bôrd′, sīn′bōrd′), *n.* تەختەی ئاگاداری؛
یافتە؛ شتی دروشم لەسەر نووسراو.

**signet** (sig′nit), *n.* (١) مۆر؛ دامغە.
(٢) جێ مۆر؛ نیشانەی مۆر یا دامغە.
*v.t.* مۆر کردن؛ مۆر لێدان؛ دامغە لێدان.

**signet ring,** ئەموستیلەی مۆر: ئەموستیلەیەکی ئیمزا لەسەر
هەڵکەنراوە لە دەستیش دەکرێو مۆریشی پێ دەکرێ.
(پێشی دەوترێ: "seal ring").

**significance** (sig-nif′ə-kəns), *n.* (١) گرنگی؛ گرنگیتی؛ بایەخ.
(٢) مەبەست؛ مانا. (٣) مانای شاراوە؛ مەبەستی ناڕاستەوخۆ.

**significancy** (sig-nif′ə-kən-si), *n.* = **significance.**

**significant** (sig-nif′ə-kənt), *adj.* (١) گرنگ؛ زۆر گرنگ؛
بە بایەخ؛ بایەخدار. (٢) بە مانا؛ پڕ مانا؛ بە مەبەست؛ مانا بەخش.
(٣) مانای شاراوەی هەیە.

**signification** (sig′nə-fi-kā′shən), *n.* (١) مانا؛ مەبەست؛
گرنگی. (٢) وا گەیاندن؛ نیشانە.

**significative** (sig-nif′ə-kā′tiv), *adj.* = **significant.**

**signify** (sig′nə-fī′), *v.t.* (١) وا گەیاندن؛ نیشانەی ئەوە بوون.
*( His rags ~ his poverty.)*
(٢) پیشاندان (بە نیشانە یا وتە)؛ دەرخستن:
*( ~ "yes" by raising your hand.)*
*v.i.* گرنگ بوون؛ مانا بەخشین؛ بەبایەخ بوون.
-signifier *(n.).*

**signior** (sēn′yôr, sēn′yōr), *n.* = **signor.**

**sign language,** زمانی کەڕو لاڵ؛ پەنجە دوویی؛ زمانی نیشانە؛
زمانی دەستو چاو.

**sign manual,** ئیمزای پاشا لە لاسەرووی فەرمانێکی پاشایییەوە.

**sign of the cross,** نیشانەی خاچ (کە لە خۆ دەدرێت لەکاتی نوێژو
نزا کردنو ناوهێنانی عیسادا بە دەس خستنە سەر ناوچەوانو هێنانە
خوارەوەی بۆ سەر سنگو بردنی بۆ سەر شانی چەپو شانی ڕاست لە شێوەی
خاچدا).

**sign of the zodiac,** یەکێکە لە دوانزە نیشانەی کەلوو، برج، یا
چەرخەکان (ئەستێرەوانی).

**signor** (sē-nyôr′), *n.* سنیۆر: پیاوی ئیتاڵی؛ کاک.
(هاوتای "Mr." ە).

**signora** (sē-nyô′rä), *n.* سنیۆرا: ئافرەتی ئیتاڵی؛ خانم؛ خان.
(هاوتای "Mrs." ە).

**signore** (sē-nyô′re), *n.* سنیۆر: (ا) پیاو. (ب) جەناب.
(هاوتای "Sir" ە).

**signorina** (sē′nyô-rē′nä), *n.* سنیۆرینا: کچی ئیتاڵی؛ خان؛
خانم. (هاوتای "Miss" ە).

**signorino** (sē′nyô-rē′nō), *n.* سنیۆرینۆ: لاوێکی ئیتاڵی
(بەتایبەتی پلەوپایەدار). (هاوتای "Master" ە).

**signory** (sēn′yēr-i), *n.* = **seigniory.**

**signpost** (sīn′pōst′), *n.* (١) ڕێ نما؛ نیشانەی سەر ڕێگە (بۆ ڕێ
پیشاندانی ڕێبوار)؛ ڕێ نیشاندەر؛ ستوونی نیشانە ڕێ.
(٢) نیشانە؛ نیشاندەر؛ ڕابەر.

**Sikh** (sēk), *n.* سیخی؛ کەسێکی سیخی؛ پەیڕەوی کەری سیخێتی.
*adj.* سیخی؛ تایبەتی بە سیخەکان.

**Sikhism** (sēk′iz'm), *n.* سیخێتی؛ ئاینو بیروباوەڕی سیخەکانی
هیندستان.

**silage** (sī′lij), *n.* ئالفی سەوزی هەڵگیراو و پارێزراو لە عەماردا.

**silence** (sī′ləns), *n.* (١) خامۆشی؛ کپی؛ کپێتی؛ بێ دەنگی:
*( the ~ of night)*
*( He listened in ~ .)* (٢) قوڕوقەپ؛ بێ دەنگی؛ قسە نەکردن؛ نەدووان:
(٣) لێ بێ دەنگ بوون؛ باس نەکردن؛ پەنهانێتی. (٤) پەیوەندی پێوە نەکردن.
(٥) لە بیرچوونەوە؛ ناو نەبران.
*v.t.* (١) دەم کوت کردن؛ بێ دەنگ کردن:
*( to ~ one's critics)*
(٢) کپ کردنەوە؛ پێ شێل کردن؛ خەفە کردن (مەجاز).
*( to ~ the enemy's guns)* (٣) خپ کردن؛ دەنگ لێ بڕین؛ بەزاندن:
*interj.* بێ دەنگ! بێ دەنگ بە! بێ قسە!
**silencer** (sī′lən-sēr), *n.* (١) بێ دەنگ کەر (مرۆڤ، شت)؛ کپکەرە.
(٢) بێ دەنگ کەری تفەنگ و دەمانچە؛ ئامێری دەنگ مرێن.
(٣) [Chiefly British]، بێ دەنگ کەری گرمەی ئۆتومبیل.
**silent** (sī′lənt), *adj.* (١) لاڵ؛ بێ زمان؛ قسە نەکەر.
(٢) نەدوو؛ کەم دوو؛ بێ دەنگ. (٣) کپ؛ خامۆش؛ کش و مات؛ خپ؛ کڕ.
(٤) دەرنەبڕاو؛ نەوتراو.
(٥) بێ دەنگ؛ باس نەکەر؛ لێ نەدوواو:
*( The report was ~ on this matter.)*
(٦) بێ ئیش وکار؛ بێ دەنگ؛ لەکار کەوتوو:
*( The machines have been ~ for a year.)*
(٧) بێ دەنگ (دەنگناسی): (وەك تیپی 'b' لە 'doubt' وە 'k' لە 'knife' دا).
*( a ~ film)* (٨) بێ گفتوگۆ (فیلم)؛ بێ دەنگ:
-silently *(adv.)*; silentness *(n.)*.
**silent butler,** بەردەستی بێ زمان: دەفرێکی سەرقاپداری دەسکدارە قنگە جگەرە و وردە زبڵی تێ دەکرێ؛ زبڵدانی سووتوو قنگە جگەرە.
**silent partner,** هاوبەشی بێ دەنگ: هاوبەشێکە کە بەشداری سەرەو کاری ئیشەکە یا بازرگانییەکە ناکات؛ هاوبەشی نوستوو.
**silents** (sī′lənts), *n. pl.* فیلمە بێ دەنگەکان؛ فیلمە بێ گفتوگۆکان.
**silenus** (sī-lē′nəs), *n.* (١) بوونەوەرێك یا دەعبایەکە لە شێوەی پیاوێکی ڕیشداری سەرخۆشی ڕووخۆشی گوێ قوتی کلك دار کە لاق و سمی لە هی بزن دەکات (ئەفسانەی یۆنانی).
(٢) بوونەوەرێك یا دەعبایەکی دارستانە وەك "satyr" (ئەفسانەی یۆنانی).
**silesia** (sī-lē′shi-ə, sə-lē′shə), *n.* کالایەکی لۆکە یا کەتانی تەنکە (بۆ بەری جل و بەرگ بەکاردەهێنرێ).
**silex** (sī′leks), *n.* (١) بەردی سلیکات.
(٢) شووشەیەکی گەرما کار تێ نەکەرە.
**silhouette** (sil′oo-et′, sil′ə-wet′), *n.* تارمایی؛ شەبەنگ؛ وێنەی تاریك.
*v.t.* وەك تارمایی پیشاندان؛ بە تارمایی دەرخستن یا نوواندن.
**silica** (sil′i-kə), *n.* سلیکا: دووەم ئۆکسیدی سلیکۆن
**silica gel,** جێلی سلیکا: سلیکایەکی لینجی مژۆکە.
**silicate** (sil′i-kit, sil′i-kāt′), *n.* سلیکات (کیمیا).
**siliceous** (sə-lish′əs), *adj.* سلیکۆنی (کیمیا).
**siliciferous** (sil′i-sif′ēr-əs), *adj.* سلیکایی: سلیکای تێدایە؛ سلیکای لێ دەردێت؛ لەگەڵ سلیکادا یەکی گرتووە.
**silicify** (sə-lis′ə-fī′), *v.t.* گۆڕین بۆ سلیکا؛ سلیکا تێ کردن.
*v.i.* گۆڕان بۆ سلیکا؛ بوون بە سلیکا.
**silicon** (sil′i-kən), *n.* سلیکۆن: توخمێکی ناکانزایی کیمیاییە لە سرووشتدا زۆرە (کیمیا).
**silicone** (sil′ə-kōn′), *n.* سلیکۆن: ئاوێتەیەکی سلیکۆنی ئۆرگانیکییە بەرهەڵستی گەرمی و ساردی و ئاو و کارەبا دەکات.
**silicosis** (sil′ə-kō′sis), *n.* نەخۆشییەکی سییەکانە نیشانەکەی هەناسە لێ بڕانە لە هەڵمژینی تۆزی سلیکاوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ تووش دەبێ (وەك لە کانە بەردا).
**silique** (si-lēk′, sil′ik), *n.* بەرێکی کەلوویی دوو بەشە پەردەیەك لەنێوانیدایە لە یەکیان جیا دەکاتەوە کە بەرەکە گەیی (لە توخمی خەرتەلەدا)
-siliquose; siliquous *(adj.)*.
**silk** (silk), *n.* (١) ئاوریشم. (٢) کالای ئاوریشم؛ دەزووی ئاوریشم.
(٣) جل و بەرگی ئاوریشم. (٤) (*pl.*)، بەرگی تایبەتی ئەسپ سواری غارغارێن و بۆکسباز و تەنافباز. (٥) پڕژی گوڵە گەنمەشامی.
*adj.* ئاوریشمی؛ ئاوریشم.
*v.i.* پڕژ دەرکردن (گوڵە گەنمەشامی).
hit the silk, [Slang], بە پەڕەشووت لە فڕۆکە هاتنە خوارەوە.
**silkaline, silkalene** (sil′kə-lēn′), *n.* کالایەکی لۆکەی تەنك و نەرمی ئەختێ بریقەدارە لە ئاوریشم دەچێ.
**silk cotton, = kapok.**
**silk-cotton tree,** درەختێکی ناوچە گەرمەکانە تووەکەی بە ڕیشاڵی ئاوریشمی داپۆشراوە. (ووشەی "ceiba" ببینە).
**silken** (sil′k'n), *adj.* (١) ئاوریشمی؛ ئاوریشم؛ لە ئاوریشم دروست کراو (٢) ئاوریشم لەبەر.
(٣) نەرم و لووس و بریقەدارە وەك ئاوریشم؛ ئاوریشمی.
*( ~ flattery)* (٤) (ا) زمان لووس؛ دەم لووس:
*( a ~ touch)* (ب) جوان و نایاب؛ شۆخ. (ج) نەرم:
**silk hat,** کڵاوی ئاوریشم: کڵاوێکی لوولەکی بە ئاوریشم یا قەیفە داپۆشراوە (پیاوان لە بۆنەی ڕەسمیدا لەسەری دەکەن).
**silk-stocking** (silk′stok′iŋ), *adj.* (١) پۆشتە؛ شۆخ؛ تەڕپۆش.
(٢) دەوڵەمەند؛ خۆش گوزەران؛ بەگزادە.
*n.* (١) کەسێکی دەوڵەمەند یا خۆش گوزەران.
(٢) [Colloq.]، Whig.
**silk-weed** (silk′wēd′), *n.* گیا ئاوریشم.
**silk-worm** (silk′wũrm′), *n.* کرمی ئاوریشم.
**silky** (sil′ki), *adj.* (١) ئاوریشمی؛ ئاوریشم؛ لە ئاوریشم دروست کراو. (٢) ساف و لووس و نەرم وەك ئاوریشم.
(٣) بە گەندەموو داپۆشراو (گەڵا). (٤) زمان لووس؛ دەم لووس.
-silky *(adv.)*; silkiness *(n.)*.
**sill** (sil), *n.* (١) (ا) چوارچێوەی ژێر پەنجەرە. (ب) چوارچێوەی بەردەرگا؛ داری دەرماڵ؛ داری ژێر دەرگا. (٢) تەختە بەردی ئاگر پڕژێنی نێوان بەردی تر (زەمین ناسی).
**sillabub** (sil′ə-bub′), *n.* = **syllabub.**
**silliness** (sil′i-nis), *n.* (١) گەوجی؛ بێ مێشکی؛ کەرێتی.
(٢) بێ مانایی؛ هیچ و پووچی.
(٣) ڕەوشت یا کردەوەی گەوجانە و هیچ و پووچانە.
**silly** (sil′i), *adj.* (١) گەوج؛ بێ مێشك؛ کەر؛ گێل.
(٢) منداڵانە (ڕەووشت، کردەوە)؛ هیچ و پووچ؛ پڕوپووچ؛ بێ مانا؛ نابەجێ؛ شایستەی پێکەنینە:
*( a ~ person, idea, reason, answer, etc.)*
(٣) [Colloq.]، گێژ (بە لێدان)؛ وڕ. (٤) [Archaic]، بێ هێز؛ لاواز.
(٥) [Archaic]، ساویلکە؛ خۆش بڕوا.
*n.* [Colloq.], کەسێکی گەوج و هیچ و پووچ.
**silo** (sī′lō), *n.* (١) (ا) عەماری ئالف؛ عەماری ئالفی سەوز؛ خانوویەکی لوولەییە ئالفی تێدا هەڵ دەگیرێ. (ب) چاڵی ئالف.
(ج) عەماری دەغڵ و دان؛ کەنوو؛ سایلۆ؛ دەغڵدانی لوولەیی.
(٢) عەماری ژێرزەمینی مووشەك.
**silt** (silt), *n.* لیتە.
*v.i.* ( ~ up ), پڕ بوون لە لیتە؛ بە لیتە داپۆشران.
*v.t.* ( ~ up) , پڕ کردن لە لیتە؛ بە لیتە داپۆشین.
-silty *(adj.)*.
**silurid** (sə-loor′id, sī-lyoor′id), *n.* جۆرە ماسییەکی ئاو ڕووبارە.

**silva** (sil′vә), *n. Also* sylva, (١) داروردەختی ناوچەیەك؛ دارستانی ناوچەیەك.
(٢) پەرتوكێكە دەربارەی دارو درەخت یا دارستانی ناوچەیەك.

**silvan** (sil′vәn), *adj. & n.* = **sylvan.**

**silver** (sil′vēr), *n.* (١) زیو (٢) پارەی زیو. (٣) قاپ‌وقاچاخی زیو؛ دەفری زیو' كەوچك‌و چەتاڵی زیو. (٤) ڕەنگ زیوی؛ خۆڵەمێشی.
*adj.* (١) زیوین؛ لە زیو دروست كراو؛ بە زیو داپۆشراو؛ زیو لێ دراو.
*( ~ thread)*
*( the ~ standard)* (٢) بنچینەكەی زیوە (پارەی وولاتێك):
(٣) لایەنگیری بەكارهێنانی زیو دەكات بۆ بنچینەی پارە.
(٤) زیوی (ڕەنگ)؛ خۆڵەمێشی.
*( a ~ tongue)* (٥) زمان پاراو؛ ڕەوانبێژ؛ بە دەم‌وپل:
*( a ~ wedding anniversary)* (٦) هی یادی بیست‌و پێنجەم:
*v.t.* (١) زیو لێدان؛ بە زیو داپۆشین.
*( trees ~ed with snow)* (٢) وەك زیو لێ كردن؛ وەك زیو لێ هاتن:
*v.i.* لە زیو چوون؛ وەك زیو لێ هاتن.

**silver age,** چەرخی زیوی (كە وەك چەرخی زێڕین گرنگ نی‌یە).

**silver bell,** درەختێكی گوڵ سپی‌ی زەنگولەیی شۆڕبووەوەیە.

**silver-bell tree,** = **silver bell.**

**silver-berry** (sil′vēr-ber´i), *n.* تووی زیوی· دەوەنێكی گوڵ بۆن خۆش‌و گەڵاو بەر زیوی‌یە.

**silver bromide,** برۆمیدی زیو· ئاوێتەیەكی زۆر ناسكە بەرامبەر بە ڕووناكی لە وێنەگرتندا بەكاردەهێنرێ.

**silver certificate,** قەواڵەی زیوی· جاران ئەمەریكا دەری دەكرد.

**silver chloride,** كلۆریدی زیوی· تۆزێكی سپی‌یە كە ڕووناكی بەركەوت ڕەش دادەگیرسێ (لە وێنە گرتندا بەكاردەهێنرێت)

**silver cord,** پەیوەندی بەینی دایك‌و منداڵ.

**silver fish** (sil′vēr-fish´), *n.* (١) ماسی‌یە زیوی
(٢) حاشەوەرێكی بێ باڵی پوولەكە زیوی شاخ درێژی كلك زبرە حەز لەشوێنی تاریك‌و شێ‌دار دەكات‌و لەسەر شەكرو نیشاستە دەژی زیان بەبەرگی پەرتووك وجل‌وبەرگ دەگەیێنێ.

**silver fox,** (١) ڕێوی‌یەكی ئەمەریكی تووك ڕەشە سەری تووكەكانی خۆڵەمێشی‌یە (٢) كەوڵی ئەم ڕێوی‌یە.

**silver gilt,** زیوی زەركەش كراو.

**silver-gray** (sil′vēr-grā´), *adj.* بۆری زیوی

**silver-haired** (sil′vēr-hârd´), *adj.* سەرسپی

**silvering** (sil′vēr-iŋ), *n.* (١) زیو لێدان.
(٢) چنینی زیوی لە شت دراو. (٣) بریقەی زیوی.

**silver iodide,** تۆزێكی زیوی بێ بۆنە ڕەش دادەگیرسێ هەر كە ڕووناكی بەركەوت (لە وێنە گرتن‌و شتی تردا بەكاردەهێنرێت).

**silver lining,** (١) قەراغی سپی یا ڕووناكی هەور.
(٢) ترووسكی ڕووناكی لە كاتی تاریكی یا ناخۆشیدا؛ ئومێدەواری لەكاتی لێ قەومان و نەگبەتیدا.

**silverly** (sil′vēr-li), *adv.* ڕەنگی زیوی؛ دەنگی زیوی.

**silvern** (sil′vērn), *adj.* [Archaic or Poetic], زیوی؛ لە زیو دەچێ.

**silver nitrate,** نیتراتی زیو.

**silver plate,** قاپی زیو؛ قاپ‌و كەوچك‌و دەفری زیو لێ دراو

**silver screen,** (١) پەردەی سینەما؛ پەردەی زیوی
(٢) ( ~ the)، سینەما.

**silver side** (sil′vēr-sīd´), *n.* **silver sides.**

**silver sides** (sil′vēr-sīdz´), *n.* جۆرە ماسی‌یەكی بچووكە هێڵی زیوی بە تەنیشتەكانی‌یەوەیەتی.

**silversmith** (silvēr-smith′), *n.* زیوگەر؛ زەڕەنگەر.

**silver standard,** بەكارهێنانی زیو وەك پێوەری پارە.

**silver-tongued** (sil′vēr-tuŋd´), *adj.* زمان پاراو؛ ڕەوانبێژ؛ بە دەم‌وپل.

**silver-ware** (sil′vēr-wār´), *n.* كەوچك‌و چەتاڵ‌و چەقۆی زیو یا زیو لێ دراو.

**silver wedding,** یادی بیست‌و پێنج ساڵەی ژن هێنان‌و شوو كردن.

**silver-wedd** (sil′vēr-wēd´), *n.* گیا زیوی؛ ڕووەكێكی لاسك درێژی گوڵ زەردی گەڵا زیوی‌یە لە ژێرەوە.

**silvery** (sil′vēr-i), *adj.* (١) زیوی؛ ڕەنگ‌و بریقەی زیوی.
*( a ~ tone)* (٢) دەنگ دەداتەوە وەك زیو؛ دەنگێكی نەرم‌و ڕوونی هەیە:
(٣) زیوین؛ زیو لێ دراو؛ بە زیو داپۆشراو؛ زیوی تێدایە.

**silviculture** (sil′vi-kul´chēr), *n.* دارستان ناسی؛ زانستی دارستان پەروەردەكردن.

**s'il vous plaît** (sēl′ vo͞o´ ple′), [Fr.], تكایە.

**sima** (sima), *n.* چینی ژێرەوەی توێكڵی زەمین (زەمین ناسی).

**simian** (sim′i-әn), *adj.* مەیموونی (بەتایبەتی هی لە مرۆڤ چوو وەك شمپانزی‌و گۆریلاو ئۆرانگەتانگ).
*n.* مەیموون.

**similar** (sim′ә-lēr), *adj.* (١) لەیەك چوو؛ چوون یەك؛ هاوجۆر؛ هاوچەشن؛ یەك چەشن. (٢) هاوشێوە (ئەندازە)؛ یەك شێوە.

**similarity** (sim´ә-lar′ә-ti), *n.* (١) لەیەك چوون؛ چوون یەكی؛ هاوشێوەیی؛ هاوچەشنی؛ یەك چەشنی.
(٢) وێنەیەك یا نموونەیەكی ئەم لێك چوونە؛ لەیەك چوونێك:
*( There are two ~ies between them.)*

**similarly** (sim′ә-lēr-li), *adv.* بە هەمان شێوە؛ بە هەمان جۆر؛ هەروەها.

**simile** (sim′ә-lē´), *n.* لێك چووان (زمانەوانی، ڕەوانبێژی)؛ لێك چوواندن (بە بەكارهێنانی "as" وە " like " ):
*( He is as brave as a lion.; Childhood is like a passing dream.)*

**similitude** (sә-mil′ә-to͞od´, sә-mil′ә-tūd´), *n.* (١) وێنەی تەقاودەق (مرۆڤ، شت)؛ هاو؛ هاوتا. (٢) شێوە؛ وێنە.
(٣) [Rare]، simile . (٤) لەیەكچوون؛ چوونیەكی؛ هاوشێوەیی.

**simitar** (sim′ә-tēr), *n.* = **scimitar.**

**simmer** (sim′ēr), *v.i.* (١) بە هێواشی كوڵان بەبێ بڵق دان؛ وورده وورده كوڵان بەبێ هاتنەكوڵ؛ مێرووله‌كردن.
*( to ~ with rage)* (٢) پیش خواردنەوە؛ لە ژێرەوە زۆر تووڕەبوون: .
*v.t.* بە هێواشی كوڵاندن بەبێ هێنانە كوڵ؛ وورده وورده كوڵاندن لەسەر ئاگرێكی كز.
*n.* , بە هێواشی كوڵاندن بەبێ هاتنەكوڵ:
*( Keep the soup at a ~ .)*
simmer down, (١) ئاگری خواردەمەنی كزكردن بۆ تونككردنەوەی خواردەمەنی‌یەكە؛ نەختێك ساردبوونەوەی خواردەمەنی‌و توندبوونەوەی:
*( Let the food simmer down.)*
(٢) ساردبوونەوە؛ هێمن بوونەوە:
*( He was very angry at first, but he simmered down later.)*

**simnel** (sim′nәl), *n.* [British], (١) جۆرە نانێكی ڕەقە.
(٢) جۆرە كێكێكە (لە ئاهەنگی وەك كریسمەسدا دەخورێ).

**simoleon** (sә-mō′li-әn), *n.* [Slang], دۆلار.

**simoniac** (si-mō′ni-ak´), *n.* كەسێكە كە پلەوپایەی كڵێسە دەكڕێ‌و دەیفرۆشێ بە پارە، واتە، بە بەرتیل.
-simoniacal *(adj.).*

**simonist** (sī′mә-nist, sim′ә-nist), *n.* = **simonaic.**

**simonize** (sı′mә-nīz´), *v.t.* پاكردنەوەو بریقە لێ هەڵسان ( بە مۆم تێهەڵسوون) (ئۆتۆمبیل).

**simon-pure** (sī′mәn-pyoor′), *adj.* پوخت؛ پوختە؛

گزی و فێڵی تیا نییە؛ پاك؛ ڕاستەقینە.
**simony** (sī′mə-ni, sim′ə-ni), *n.* کڕین و فرۆشتنی پلەوپایەی کڵێسە بە پارە، واتە، بە بەرتیل.
**simoom** (si-mōōm′), *n. Also* simoon, سموم: بایەکی گەرمی بەهێزی تەپ و تۆزاوییە.
**simp** (simp), [Slang], = simpleton.
**simper** (sim′pēr), *v.i.* مزەهاتن: بزە لێوە هاتن بە مانا، بە درۆ، یا بە تەوسەوە.
*n.* مزە؛ زەردەخەنەی بە مانا، بە درۆ، یا بە تەوسەوە.
**simple** (sim′p'l), *adj.* (١) تاك؛ تەنها؛ ناتێکەڵاو؛ نائاڵۆز: *( a ~ sentence)*
(٢) بێ پێچ و پەنا؛ نائاڵۆز: *( a ~ pattern)* .
(٣) ئاسان؛ سووك: *( a ~ task, question, etc.)* .
(٤) نارازاوە؛ ساکار؛ سادە: *( ~ food; a ~ style of architecture)* .
(٥) ڕووت؛ بێ کەم و زیاد؛ پەتی؛ تەواو: *( Here are the ~ facts.)* .
(٦) بێ فڕوفێڵ؛ پاك؛ ڕاست؛ دڵپاك.
(٧) خاکی؛ بێ فیز؛ بێ هەوا؛ سادە؛ بێ ناز: *( a ~ man)* .
(٨) (ا) پلەوپایە نزم. (ب) ئاسایی. (٩) ناگرنگ.
(١٠) ساویلکە؛ گێل؛ بە سزمان؛ خۆش بڕوا. (١١) [Dial.]، بێ مێشك.
(١٢) (ا) ناتاوێتە (کیمیا). (ب) سەرەتایی (کیمیا). (١٣) بێ مەرج (یاسا).
*n.* (١) کەسێکی ساویلکە یا گێل؛ کەسێکی خۆش بڕوا.
(٢) (ا) گیای پزیشکی (ب) دەرمانی لەم گیایە دەرهێنراو.
(٣) شتێکی سادە و نائاڵۆز.
(٤) [Archaic]، کەسێکی بنەچە هەژار؛ کەسێکی پلەوپایە نزم.
**simple equation,** هارکێشەی سادە (بیرکاری)
**simple fraction,** کەرتی ئاسایی (بیرکاری).
**simple-hearted** (sim′p'l-här′tid), *adj.* دڵپاك؛ بێ فڕوفێڵ؛ سادە؛ دڵساف.
**simple interest,** قازانجی سادە؛ قازانجی ڕووت؛ ئەو قازانجەیە کە دەدرێ تەنها لەسەر مایەی ئەو پارەیەی لە بانقدا دادەنرێ نەك لەسەر قازانجەکە. (وشەی " compound interest " ببینە).
**simple machine,** مەکینە یا ئامێری سادە: خولخولۆکە، نوێڵ؛ دەرنەفیس؛ پەوڕەوە؛ ڕەندە... هتد.
**simple-minded** (sim′p'l-mīn′did), *adj.* (١) ساویلکە؛ خۆش بڕوا؛ دڵپاك؛ دڵساف. (٢) گێل؛ گەوج؛ کەر.
(٣) مێشك سووك؛ بێ مێشك.
-simple-mindedly *(adv.)*; simple-mindedness *(n.)*.
**simple sentence,** ڕستەی سادە (ڕێزمان)؛ سادە ڕستە. (وێنە: *The boy ran.; She sang a song.*).
**simpleton** (sim′p'l-tən), *n.* کەسێکی حەپۆل، ساویلکە، کەر، نەزان، یا بێ مێشك.
**simplex** (sim′pleks), *adj.* (١) تاك؛ یەك پارچە؛ نائاڵۆز؛ سادە.
(٢) تایبەتی بە شێوەیەکی تەلەگراف ناردنە کە تەنها یەك نامە دەنێرێ لە هەمان کاتدا.
**simplicity** (sim-plis′ə-ti), *n.* (١) نائاڵۆزی؛ بێ پێچ و پەنایی.
(٢) ئاسانی؛ سووکی.
(٣) خاکێتی؛ سادەیی؛ ساکارێتی: *( the ~ of country life)* .
(٤) دڵپاکێتی؛ دڵپاکی؛ دڵسۆزی؛ بێ فێڵ و تەڵەکەیی.
(٥) ساویلکەیی؛ گێلی؛ کەرێتی؛ بێ مێشکی.
**simplification** (sim′plə-fi-kā′shən), *n.* (١) ئاسان کردن.
(٢) ئەنجامی ئەم ئاسان کردنە.
**simplify** (sim′plə-fī′), *v.t.* ئاسان کردن.
-simplifier *(n.)*.
**simply** (sim′pli), *adv.* (١) بە ئاسانی؛ بەبێ پێچ و پەنا؛ بە ڕوونی؛ بە سادەیی.
(٢) هەر؛ تەنها؛ بێ کەم و زیاد: *( His answer was ~ this.)*
(٣) تەواو؛ بە تەواوی. *( This is ~ unacceptable.)*
**simulacrum** (sim′yoolā′krəm), *n.* (١) وێنە.
(٢) وێنەی درۆ؛ وێنەی ناتەواو؛ لاسایی.
**simulant** (sim′yoo-lənt), *adj.* لاساییکەرەوە (زیندەوەرزانی)؛ خۆ بە شتی تر پیشاندەر.
**simular** (sim′yoo-lẽr), *n.* = simulator.
*adj.* (١) درۆ؛ ساختە. (٢) لاساییکەرەوەی شتێك.
**simulate** (sim′yoolāt′), *v.t.* (١) بە درۆ وا پیشاندان؛ وا نوواندن؛ بە ڕواڵەت وا دەرخستن: *( to ~ an interest)* .
(٢) لاساییکردنەوە (بەشێوە یا کردەوە)؛ خۆ وەك شتێکی تر پیشاندان: *( The insect ~d a twig.)*
*adj.* درۆ؛ ساختە؛ لاسایی؛ ڕواڵەت.
**simulation** (sim′yoo-lā′shən), *n.* (١) بە درۆ وا پیشاندان؛ وا نوواندن؛ ڕواڵەت. (٢) لێکچوونی درۆ؛ لاسایی.
**simulator** (sim′yoo-lāt′ẽr), *n.* لاساییکەرەوە (مرۆڤ، شت، مەکینە)
**simulcast** (sī′məl-kast′, sī′məl-käst′), *v.t.* بڵاوکردنەوەی بەرنامەیەك بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە هەمان کاتدا.
*n.* بەرنامەیەکی بڵاوکراوە بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە هەمان کاتدا.
**simultaneity** (sī′m'l-tə-nē′ə-ti), *n.* هەمان کاتێتی (ڕوودان)؛ یەك کاتی؛ پێکەوەیی
**simultaneous** (sī′m'l-tā′ni-əs), *adj.* هاوکات؛ هەمان کات (ڕوودان)؛ یەك کات؛ لە یەك کاتدا ڕووداو؛ پێکەوە ڕوودراو.
**simultaneously** (sī′m'l-tā′ni-əs-li), *adv.* لە یەك کاتدا؛ لە هەمان کاتدا؛ پێکەوە.
**sin** (sēn), *n.* گوناه؛ گوناح؛ تاوان (بەتایبەتی دژی بیروباوەڕ و نەریتی ئاینی و کۆمەڵایەتی).
*v.i. & v.t.* گوناه کردن؛ گوناح کردن؛ تاوان کردن (دژی ئاین).
**since** (sins), *adv.* (١) لەو کاتەوە تا ئێستا؛ لەو ساوە تا ئێستا. *( He came last Friday and has been here ever ~ .)*
(٢) لەوساوە؛ لەو کاتەوە: *( He was injured a year ago but has ~ fully recovered.)*
(٣) لەمەوپێش؛ لەپێش ئێستاوە: *( She disappeared many years ~ .)*
*prep.* لە (کات)؛ لەو کاتەوە؛ لە کاتێکی ڕابوردووەوە تا ئێستا: *( We have been walking ~ one o'clock.)*
*conj.* (١) ئەوەتەی؛ ئەوەتای؛ لەوساوە؛ لەوکاتەوە.
(٢) لەبەرئەوەی؛ چونکە: *( ~ we have no money, we can't buy it.)* .
ever since, لەو ساوە؛ لەو کاتەوە: *( He came here ten years ago and has lived here ever since.)*
long since, دەمێکە.
**sincere** (sin-sêr′), *adj.* (١) دڵسۆز؛ دڵپاك؛ ڕاست؛ پاك؛ جگەرسۆز؛ بێ فڕوفێڵ. (٢) ڕاستەقینە؛ ڕاست؛ بێ ڕواڵەت.
(٣) [Archaic]، پوخت؛ پوختە؛ گزی و فێڵی تێدا نەکراوە.
(٤) [Obs.]، ساغ.
**sincerely** (sin-sêr′li), *adv.* بە دڵ؛ بە دڵپاکی؛ بە ڕاستی.
**sincerity** (sin-ser′ə-ti), *n.* دڵسۆزی؛ دڵپاکی؛ ڕاستی؛ جگەرسوزی.
**sinciput** (sin′si-put′), *n.* (١) لاسەرووی کەللەی سەر (کە ناوچەوانیش دەگرێتەوە). (٢) ناوچەوان.
-sinciputal *( adj.)*.
**sine** (sīn), *n.* گیرفانی گۆشە: ڕێژەی لای بەرامبەری گۆشەکە بۆ ژێی سێ گۆشەکە (بیرکاری).
**sine** (sī′ni), *prep.* [L.], بەبێ.
**sinecure** (sī′ni-kyoor′, sin′ə-kyoor′), *n.* پلەوپایەی بێکار؛

مووچەی بەلاش: (ا) پلەوپایەیەکی کلێسەیە کە مووچە دەدات بە خاوەنەکەی بەبێ ئەوەی هیچ ئیشێك بکات. (ب) پلەوپایەیەکە کە خاوەنەکەی مووچەی پێ وەردەگرێ بەبێ ئەوەی هیچ ئیش بکات.

-sinecurism *(n.)*; sinecurist *(n.)*.

**sine die** (sī′ni dī′ē), [L.], هەتا کاتێکی دیاری نەکراو؛ بەبێ دانانی کاتێك (بۆ کۆبوونەوە): *( The parliament adjourned ~ .)*.

**sine qua non** (sī′ni kwān non′), [L.], مەرجێکی بنچینەیی؛ شتێکی زۆر پێویست؛ بەبێ ئەوە نابێ؛ مەرجی پێویست.

**sinew** (sin′ū), *n.* (١) ژێ (تونکاری)؛ ماسوولکەژێ. (٢) بازوو؛ باهوو؛ هێزی بازوو؛ هێز؛ ماسوولکە. (٣) سەرچاوەی هێز.

*v.t.* بەهێز کردن.

**sinewy** (sin′yoo-wi), *adj.* (١) ژێیی (تونکاری)؛ ماسوولکە ژێیی. (٢) پڕ لە ماسوولکە (پارچە گۆشت) (٣) بازوودار؛ باهوودار؛ ماسوولکەدار؛ بەهێز: *( ~ shoulders)*. (٤) بەهێز؛ بەتین؛ بە ووزە: *( a ~ style of writing)*.

**sinfonia** (sin′fə-nē′ə), *n.* [It.], = symphony.

**sinful** (sin′fəl), *adj.* گوناهبار؛ گوناهکار؛ گوناه؛ کفر؛ کافر؛ بەد؛ بەدکار؛ پیس؛ زۆر خراپ: *( a ~ person, act, feeling, etc.)*.

-sinfully *(adv.)*; sinfullness *(n.)*.

**sing** (siŋ), *v.i.* (١) گۆرانی ووتن؛ سۆزەکردن؛ سۆزکردن. (٢) (ا) ( ~ of )، گۆرانی پیاهەڵدان؛ گۆرانی بەسەردا هەڵدان؛ پیاهەڵدان؛ شیعر پیاهەڵدان: *( He sang of his beloved homeland.)*. (ب) هۆنینەوە. (٣) خوێندن (مەل)؛ جریکاندن؛ جریکەجریك کردن. (٤) زیزەکردن؛ گفەکردن (گوللە، مووشەك)؛ فیکەکردن (کتلی)؛ ویزەویزکردن؛ زرنگانەوە (گوێ): *( The kettle was ~ing on the fire.)*. (٥) کران بە گۆرانی (هەڵبەست)؛ باش بوون بۆ کردن بە گۆرانی. (٦) زۆر دڵ خۆش کردن؛ زۆر پێ خۆش بوون: *( a sight to make one's heart ~ )* (٧) [Slang]، دان بە تاوانێکدا نان (بە تایبەتی بۆ خەڵك پێوەکردن).

*v.t.* (١) بە گۆرانی ووتن؛ کردن بە گۆرانی؛ گۆرانی ووتن؛ گۆرانییەك ووتن. (٢) وەك گۆرانی خوێندنەوە (قورئان، نوێژی بەکۆمەڵ لە کلێسەدا)؛ سروود خوێندنەوە. (٣) گۆرانی پێداهەڵدان؛ گۆرانی بەسەرداهەڵدان؛ پێداهەڵدان؛ شیعر بەسەردا هەڵدان: *( They all ~ his praises.)*. (٤) کردنەخەو بە گۆرانی؛ لایلایە بۆ کردن: *( to ~ a child to sleep)*.

*n.* (١) گفە (گوللە)؛ فیکە (کتلی)؛ زیزەزیز؛ ویزەویز. (٢) [Colloq.]، گۆرانی (ووتن) بە کۆمەڵ؛ گەلە گۆرانی.

**sing.**, = singular.

**singable** (siŋ′ə-b′l), *adj.* دەکرێت بە گۆرانی؛ دەتوانرێ بووترێ بە گۆرانی

**singe** (sinj), *v.t.* هەڵکرووزاندن (تووك، قژ، پەڕ، پڕژی گوڵە گەنمەشامی و کەنە ... هتد)؛ هەڵبرووزاندن؛ هەڵکزاندن؛ هەڵبرووکاندن.

*n.* (١) هەڵکرووزان؛ هەڵکزان؛ هەڵبرووزان؛ هەڵبرووکان. (٢) هەڵکرووزاوی؛ هەڵکزاوی

**singer** (siŋ′ēr), *n.* (١) گۆرانی بێژ؛ شایەر (٢) مەلی دەنگخۆش. (٣) هۆنەر؛ شاعیر

**single** (siŋ′g'l), *adj.* (١) تاك؛ یەك؛ تەنها یەکێك. (٢) تەنها؛ بە تەنها؛ بە تەنیا. (٣) یەك کەسی؛ یەك خێزانی: *( a ~ room, bed, house, etc.)*. (٤) [British]، گەند (بیرە)؛ روون. (٥) دوو کەسی؛ تەنیا لەنێوان دوو کەسدایە: *( ~ combat )*. (٦) (ا) رەبەن؛ سەڵت؛ زگورتی: *( a ~ man or woman; to remain ~)*. (ب) هی رەبەن؛ تایبەتی بە سەڵت یا زگورتی: *( a ~ life)*. (٧) یەك پارچەیی؛ یەك بەشی. (٨) یەك ریزی (پەڕەی گوڵ). (٩) دڵپاك؛ راست؛ دڵسۆز؛ پاك. (١٠) جیاوازی نەکردن لە بەینەدا؛ بە یەك ( یا هەمان) چاو سەیری شت کردن: *( Judge with a ~ eye.)* (١١) simplex.

*v.t.* ( ~ out ), جیاکردنەوە (لە خەڵك یا شتی تر): *( to ~ somebody out for punishment, praise, etc.)*

*n.* (١) کەسێك؛ شتێك؛ یەك کەس یا شت. (٢) لێدانێکە کە هەر دەگاتە بنکەی یەکەم (یاری بێسبۆڵ). (٣) یاری دوو کەسی (گۆلف). (٤) (.pl) یاری دوو کەسی (تەنس).

**single-action** (siŋ′g'l-ak′shən), *adj.* تایبەتی بە چەکێکی ئاگرین کە دەبێ بە دەست بهێنرێتە سەر پێ بۆئەوەی بتەقێنرێ؛ تاك تەقەیی.

**single-breasted** (siŋ′g'l-bres′tid), *adj.* یەك ریز دوگمەی پێوەیە (چاکەت): *( a ~ jacket)*.

**single combat,** جەنگی یەك کەسی (لەنێوان دوو کەسی چەکداردا).

**sigle entry,** دەفتەرگری یەکلایی.

-sigle-entry *(adj.)*.

**single file,** ریزی یەکی (مرۆڤ، سەرباز، چوارپێ؛ شتومەك)؛ تاك ریز: *( The men were marching ~ .)*. (پێشی دەووترێ: " Indian file ").

**single-foot** (siŋ′g'l-foot′), *n.* رەوتێکی ئەسپە کە هەر جارەی دەسێك یا پاشوویەکی بە جیا دادەنێ.

*v.i.* بەم جۆرە رەوت کردن.

**single-handed** (siŋ′g'l-han′did), *adj.* (١) یەك دەستی هەیە یا بەکاری دەهێنێ؛ تاك دەستە. (٢) بە یەك دەست بەکاردەهێنرێ؛ بۆ یەك دەست کراوە؛ یەك دەستی: *( a ~ sword)*. (٣) بە تەنیا؛ بە تاقی تەنها؛ هەر تەنها خۆ؛ بەبێ یارمەتی کەس.

-sinle-handedly *(adv.)*.

**single-hearted** (siŋ′g'l-här′tid), *adj.* دڵپاك؛ دڵسۆز؛ پاك؛ راست؛ یەك بار؛ یەك دڵ.

**single-minded** (siŋ′g'l-mīn′did), *adj.* (١) دڵپاك؛ دڵسۆز؛ پاك؛ راست؛ یەك بار؛ یەك دڵ. (٢) یەك مەبەست؛ یەك ڕا؛ هەر خولیای یەك مەبەست یا یەك ڕایە؛ هەر یەك شت مەبەستێتی.

**single-phase** (siŋ′g'l-fāz′), *adj.* تاك بار (کارەبا)؛ تاك تەزووی گۆڕاو یا بەنۆبەی کارەبایی.

**single-stick** (siŋ′g'l-stik′), *n.* (١) کوتەك؛ گورز؛ دارێکە لە شیر دەچێ بۆ یاری. (٢) یاری داربازی (لە شیر بازی دەچێ).

**single-sticker** (siŋ′g'l-stik′ēr), *n.* [Colloq.], بەلەمی بایەوانی تاك داری.

**singlet** (siŋ′glit), *n.* [British], فانیلەی ژێرەوەی پیاوان.

**single tax,** (١) تاکە باج؛ کۆکردنەوەی هەموو داهاتی میری لە تاکە باجێك بەتایبەتی لەسەر زەوی‌وزار. (٢) ئەم باجە.

**singleton** (siŋ′g'l-tən), *n.* (١) کاغەزی تاك (لە دەستی یاریکەر یا قومارکەردا). (٢) کەسێکی جیا؛ شتێکی جیا؛ تاقانە؛ منداڵی تاقانە؛ منداڵی بە تاکانە لەدایکبوو.

**single-track** (siŋ′g'l-trak′), *adj.* (١) تاکە ڕێ؛ تاکە هێڵ (شەمەندەفەر): *( a ~ railroad)*. (٢) تەسك (مێشك): *( a ~ mind)*.

**single-tree** (siŋ′g'l-trē′), *n.* = whiffletree.

**singly** (siŋ′gli), *adv.* (١) بە تەنها؛ تەنها. (٢) یەك لەدوای یەك؛ یەك یەك‌و بە ریز؛ یەك بە یەك؛ تاك تاك؛ دانە دانە *( They entered the room ~ .)* (٣) بە تاقی تەنیا؛ بە تەنیا؛ هەر تەنها خۆ؛ بە بێ یارمەتی کەس. (هەروەها " single-handed ").

**sing-song** (siŋ′sôŋ′, siŋ′soŋ′), *n.* (١) هۆنراوەی یەك نەوا. (٢) ئاوازی یەك نەوا.

*adj.* یەك نەوا؛ یەك ئاواز.

*v.t. & v.i.* هۆنراوە خوێندنەوە یا گۆرانی ووتن بە دەنگێکی یەك نەوا.

**singular** (siŋ′gyoo-lẽr), *adj.* (١) تەنها؛ بێ هاوتا؛ یەك.

(٢) (أ) جیا؛ جیاواز.

(ب) [Obs.] تایبەتی بە کەسێك؛ هی خۆ؛ کەسی؛ تایبەتی.

(٣) سەیر؛ ناناسا: ***( What a ~ remark! )*** .

(٤) سەرناسا؛ نایاب؛ سەرنج ڕاکێش؛ هەڵکەوتوو:

***( a woman of ~ beauty)***

(٥) تاك (ڕێزمان). (٦) تایبەتی بە یەك شت (ژیربێژی).

***n.*** تاك (ڕێزمان): بار یا ڕێژەی تاك:

***( The ~ of "women" is "woman".)***

**singularity** (siŋ′gyoo-lar′ə-ti), *n.* (١) تاکێتی؛ جیاوازی؛ تاکی.

(٢) تایبەخۆیی؛ تایبەخۆ؛ شتێکی تایبەتی بە خۆ (نەریت، خوو).

(٣) شتێکی جیا؛ ناناسا؛ یا هەڵکەوت.

**singularize** (siŋ′gyoo-lə-rīz′), *v.t.* جیاکردنەوە؛ دەرخستن؛ سەرنج بۆ ڕاکێشان بە تەنها؛ تایبەتی کردن.

**singularly** (siŋ′gyoo-lar′ə-li), *adv.* بە شێوەیەکی تایبەتی؛ بەتایبەتی؛ نێجگار.

**Sinicism** (sin′ə-siz′m), *n.* شتێکی تایبەتی بە چینییەکان (خوو، نەریت، نەریتی زمان... هتد).

**sinister** (sin′is-tẽr), *adj.* (١) چەپ؛ لای چەپ

(٢) بە لای چەپی درووشمی (سەر قەڵغانی) کەسێکەوە نراوە (نیشانەیەکە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە ئەو کەسە زۆڵە).

(٣) بەد؛ ناپەسەند؛ ناحەز؛ پیس؛ بەدکار: ***( a ~ face, person, etc.)*** .

(٤) بەیووم؛ خراپ؛ نەهات؛ نامەد: ***( a ~ beginning, sign, etc.)*** .

**sinistral** (sin′is-trəl), *adj.* (١) هی چەپ؛ هی لای چەپ؛ ڕووی کردووەتە لای چەپ. (٢) چەپلەر؛ چەپە.

(٣) تایبەتی بە گوێچکەماسییەك یا قاقلەیەکی پێچ خواردوو بەلای چەپدا.

**sinistro-** (sin′is-trō, sin′is-trə), *Also* sinistr-, پێشگرێکە بە مانای: لە چەپەوە؛ چەپلەر؛ بەرەو لای چەپ: ***( ~ - dextral )*** .

**sinistro-dextral** (sin′is-trō-deks′trəl), *adj.* لە چەپەوە بۆ ڕاست (وەك جووڵانی دەست لە نووسینی ئینگلیزیدا).

**sinistrorse** (sin′is-trôrs′, sin′is-trôrs′), *adj.* بەرزبووەتەوە بە پێچ لوول لە ڕاستەوە بۆ چەپ (ڕووەك): ***( a ~ vine)*** .

**sinistrous** (sin′is-trəs), *adj.* بەیووم؛ نەهات؛ نامەد.

**Sinitic** (si-nit′ik), *n.* چینی: یەکێکە لە دوو لقی زمانە چینی تیبێتییەکان کە هەموو شێوە زمانەکانی چین دەگرێتەوە.

***adj.*** چینی (وولات، گەل، زمان)؛ تایبەتی بە چین و چینییەکان.

**sink** (siŋk), *v.i.* (١) نوقوم بوون (لە ئاو، قوڕ، بەفردا)؛ ژێر ئاو کەوتن؛ ڕووچوون:

***( The ship sank.; Wood does not ~ in water.)***

(٢) بەربوونەوە؛ کەوتنەخوارەوە:

***( The ballon sank to the earth.; She sank into a chair.)***

(٣) وون بوون؛ لەچاو وون بوون:

***( The moon sank behind a cloud.)***

(٤) نەوین؛ نیشتن (بناغە، سەربان، ئاستی ئاو)؛ داچوون؛ داکەوتن:

***( The roof has sunk.; The foundation is ~ing.)***

(٥) دامرکانەوە (ئاگر، با، دەنگ)؛ کزبوون؛ هێمن بوونەوە؛ کەم بوونەوە.

(٦) شکان (نرخ)؛ داشکان؛ هاتنەخوارەوە: ***( Prices are ~ing.)*** .

(٧) چوون بە قووڵدا (چاو، دەموچاو).

(٨) داکەوتن؛ کەوتن؛ ڕووخان (مەجاز):

***( His heart sank at the thought of failure.)***

(٩) نزیکی مردن بوونەوە؛ هەرەس بردن (تەندرووستی)؛ داچوون:

***( He is ~ing rapidly.)***

(١٠) دانەدواوە؛ بە ئاخدا چوون؛ نشوستی هێنان؛ داچوون (پلەوپایە)؛ بەرەو دواوە چوون (کۆمەڵ).

(١١) پیاچوون؛ پیا چوونەخوارەوە:

***( Water ~s rapidly through topsoil.)***

(١٢) لە مێشکدا چەسپ بوون؛ لە دڵدا چەسپ بوون.

***v.t.*** (١) نوقوم کردن؛ ژێر ئاو خستن:

***( High waves sank the boat.; He sank his spade in the ground.)***

(٢) داخستن؛ نزم کردنەوە؛ شۆڕکردنەوە:

***( She sank her head in her hands.)***

(٣) هەڵکەندن (بیر، کان، نیشان).

(٤) کەمکردنەوە؛ کزکردن (دەنگ).

(٥) پارە خستنەکار؛ بە بەرهەمهێنان.

(٦) لە کیس چوون (لە ئەنجامی پارە خستنەکارەوە)؛ دۆڕاندن:

***( He sank a fortune in that fraud.)***

(٧) شاردنەوە (بەڵگە)؛ دەرنەخستن؛ پیشان نەدان.

(٨) دانەوە (قەرز).

(٩) ڕیسواکردن؛ سووك کردن؛ شکاندن (پلە، ناموس، بایەخ).

***n.*** (١) زێراب؛ چاڵە گوو.

(٢) شوێنێکی پیس وبۆگەن؛ سەرچاوەی سووکی و بەدڕەوشتی

(٣) دەستشۆر؛ حەوزۆچکەی دەستشۆرین یا قاپ شۆرین: ***( a kitchen ~ )*** .

(٤) چاڵایی (بەتایبەتی کە ئاوی تێدا کۆبێتەوە).

sink in, [Colloq.], بەتەواوی چوونە مێشکەوە؛ بەتەواوی هەستپێکردن یا تێگەیشتن:

***( The news of his death hasn't sunk in yet.)***

**sinker** (siŋk′ẽr), *n.* (١) نوقومکەر؛ ژێرئاوخەر.

(٢) قورسایییەکی وەك قوڕقوشمە تۆڕی ڕاوەماسی و قولاپی پێ نوقوم دەکرێ لە ئاودا. (٣) [Colloq.]، **doughnut** .

**sink-hole** (siŋk′hōl′), *n.* (١) ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕۆکە.

(٢) چاڵاو (بەتایبەتی لە شوێنێکی بەردەڵانیداو ئاوەکەیشی لێوە بچێتە خوارەوە بۆ ژێرزەمین).

**sinking fund,** پارەیەکە دەخرێتە لاوە بۆ قەرزدانەوە.

**sinless** (sin′lis), *adj.* بێ گوناە؛ بێ گوناح؛ بێ تاوان.

**sinner** (sin′ẽr), *n.* گوناهبار؛ گوناحکار؛ تاوانکار.

**Sino-** (sī′nō, sin′ō), پێشگرێکە بەمانای: (أ) چینی (گەل، زمان):

***( Sinology )***

(ب) چینی و: ***( Sino-Japanese )*** .

**Sinologue** (sī′nə-lôg′, sin′ə-lôg′), *n.* چینناس؛ زانای زمان و وێژە و نەریت و کلتووری چین.

**Sinology** (sī-nol′ə-ji, si-nol′ə-ji), *n.* چینناسی؛ لێکۆڵینەوەی زمان و نەریت و وێژە و کلتووری چین.

**sinter** (sin′tẽr), *n.* (١) خڵتەی کانزایی کانیاو.

(٢) توێەڵی ناکانزایی لەسەر یەك کەڵەکە بووی چنگ دەرە یەك

***v.i. & v.t.*** توێەڵ کردن؛ کەڵەکەبوون لەسەر یەك.

**sinuate** (sin′ū-it), *adj.* (١) چاڵ وچۆڵاوی؛ خواروخێچ؛ پێچاوی؛ پێچ خواردوو؛ پێچ پێچ. (٢) قەراغ چاڵ وچۆڵاوی یا خواروخێچ (گەڵا).

***v.i.*** پێچ خواردن؛ چاڵ وچۆڵ تێکەوتن.

-sinuately *(adv.)*; sinuation *(n.)*.

**sinuosity** (sin′ū-os′ə-ti), *n.* (١) پێچ پێچی؛ چاڵ وچۆڵاویتی.

(٢) پێچ (بەتایبەتی چەند دانەیەك)؛ بادانەوە؛ لۆفە. (٣) شتێکی پێچاوپێچ؛ شتێکی چاڵ وچۆڵ، پێچ لوول، یا پێچاوی.

**sinuous** (sin′ū-əs), *adj.* (١) پێچاوپێچ؛ خواروخێچ؛ پێچاوی.

(٢) چەوت؛ سەرچەوت؛ ناپاك؛ فێڵباز. (٣) ئاڵۆز؛ ئاڵۆسکاو.

(٤) قەراغ پێچاوی یا خواروخێچ.

-sinuously *(adv.)*; sinuousness *(n.)*.

**sinus** (sī′nəs), *n.* (١) پێچ. (٢) بۆشایی.

(٢) (ا) هەردوو بۆشاییەکەی بەینی لووت و کاژێری سەروو؛ بۆشاییەکانی ناو ئێسقانەکانی لووت. (ب) دەماری خوێنی پیس بەر. (ج) بەشێکی فراوان بووی بۆری حوێن (٤) چالایی بەینی دوو گوێچکەی گەلا. (٥) بۆری دوومەڵ. (٦) sinusitis.

**sinusitis** (sī´nəs-ī′tis), ***n.*** ئاوسانی بۆشاییەکانی ناو ئێسقانەکانی لووت.

**sip** (sip), ***v.t. & v.i.*** قوم لێدان؛ مژلێدان
***n.*** (١) قوم لێدان؛ مژلێدان. (٢) قوم؛ مژ؛ چۆڕ.

**siphon** (sī′fən), ***n.*** سیفۆن؛ لوولەی سیفۆن؛ ووشترگەروو؛ پێمژە.
***v.t.*** بە سیفۆن هەڵمژین یا ڕاکێشان؛ سیفۆن کردن؛ هەڵمژین؛ دەرهێنان.
***v.i.*** بە سیفۆندا تێپەڕین؛ بە لوولەی سیفۆندا چوون.

**siphon bottle,** شووشەی سیفۆن؛ بوتڵی سیفۆن؛ سیفۆن.

**sippet** (sip′it), ***n.*** (١) پارچەیەک نانی باش برژاوی تێ ووشراوە ناوشلەوە. (٢) پارچەیە نانی سوورەوەکراوی قاپ پێ ڕازێنراوە. (٣) پارچە؛ کوت؛ پەنچك.

**sir** (sûr), ***n.*** (١) جەناب؛ قوربان؛ گەورەم؛ ***( Yes, ~ .)*** .
(٢) [S-]: نازناوی سوارچاك و پیاوی گەورەی تری ئینگلیزە:
***( ~ Walter Raleigh )***
(٣) [Obs.]: ناوێکە خەڵکی پێ بانگ دەکرێ وەك: "ئەفەندی"، "جەنابی فلان کەس" ***( ~ judge; ~ knight; ~ priest )***
(٤) [Obs.]: پیاوێکی گەورە یا پلەوپایەدار؛ لۆرد.

**sirdar** (sēr-där′, sûr′där), ***n.*** (١) سەردار (ا) سەردار؛ سەرۆك. (ب) ئەفسەرێکی گەورە. (ج) سەرۆکی بەردەستەکان
(٢) فەرماندەی ئینگلیزی سوپای میسری کۆن.

**sire** (sīr), ***n.*** (١) (ا) کەسێکی گەورە یا پلەوپایەدار. (ب) ناوێکە بۆ بانگ کردنی پاشا بەمانای " (جەنابی) خاوەن شکۆ " (وەك: " your majesty " وایە). (٢) [Poetic]: باوك؛ باب؛ باووباپیر.
(٣) باوکەی گیاندارێك (بەتایبەتی هی ماڵی وەك ئەسپ).
(٤) [Archaic]: پیاوێکی گەورە یا پایەدار.
***v.t.*** بوون بە باوکەی جوانوو؛ لێ بوونەوە (جوانوو)؛ لێ بوون؛ خستنەوە.

**siren** (sī′rən), ***n.*** (١) بوونێکی دەریایی ئەفسانەیی دەنگ خۆشە سەری ئافرەت و لەشی مەل هەیە کەشتییەوانی فریوە دەدا بە سۆزی خۆشی هەتا کەشتییەکەیان دەشکا لە کەنار دەریای بەردەڵانیداو دەمردن (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) ژنی هەڵفریوێن؛ ئافرەتێکە کە جوانییەکەی بەکاردەهێنێ بۆ فریوەدان. (٣) فیکەی ووریاکردنەوە (ئاگر، بۆمباران، تەمی کەنار دەریا... هتد) ***( an air-raid ~ ; a fire ~ ; a tornado ~ )*** .
(٤) گیاندارێکە لە توخمی قورناویلکە لاقی دواوەی نییە.
***adj.*** دڵفڕێن؛ تاوکەر؛ فریودەر؛ هەڵفریوێن.

**sirenian** (sī-rē′ni-ən), ***n.*** یەکێکە لە کۆمەڵە گیاندارێکی دەریایی شیردەری گیاخۆری گەورە وەك مانگای دەریا.

**sirloin** (sûr′loin), ***n.*** پارچەیە گۆشتی گای نایابی لاسەرووی کەلەکەیە.

**sirocco** (sə-rok′ō), ***n.*** (١) بایەکی گەرمی ناخۆشە لە بیابانەکانی سەرووی ئەفەریقاوە هەڵ دەکات بەرەو خواروی ئەورووپا.
(٢) بایەکی گەرم و بۆخەو ناخۆش.

**sirrah** (sir′ə), ***n.*** [Archaic], کورە!؛ کابرا! (بۆ بانگ کردنی کەسێك بە سووکی)

**sirree, siree** (sûr), ***n.*** [Colloq.] = sir.

**sir-reverence** (sûr′rev′ẽr-əns), ***interj.*** [Obs.]. دوور لە ڕووی تۆ؛ دوور لە ڕووی ئێوە.

**sirup** (sir′əp, sûr′əp), ***n.*** = syrup.

**sis** (sis), ***n.*** [Colloq.], = sister.

**sisal** (sī′sil, sis′'l), ***n.*** (١) ڕیشاڵێکی قایمە گوشی لێ درووست دەکرێ (لە گەڵای ڕووەکێکی مەکسیکییەوە وەردەگیرێ). (٢) ڕووەکێکە ئەم ڕیشاڵەی لێوە دەست دەکەوێ. (پێشی دەووترێ: " sisal hemp ").

**siskin** (sis′kin), ***n.*** باڵندەیەکە لە فیسقەگوڵە دەچێ.

**sissified** (sis′ə-fīd´), ***adj.*** سەرژنانی؛ کچانی؛ ژنانی.

**sissify** (sis′ə-fī´), ***v.t.*** کردن بە سەرژنانی؛ کردن بە کچانی.

**sissy** (sis′i), ***n.*** [Colloq.], (١) کوڕێك یا پیاوێکی سەرژنانی؛ ژنانی؛ کچانی. (٢) کەسێکی ترسنۆك؛ ترکەن؛ تسکەن؛ شلە شاری. (٣) خوشك

**sister** (sis′tẽr), ***n.*** (١) خوشك.
(٢) نیو خوشك. (پێی دەووترێ: " half sister ").
(٣) (ا) خوشك: ئافرەتێکە کە ئەندامی هەمان ڕێکخراو، پیشە، یا ڕەگەز بێ. (ب) ئافرەتێکی برادەرە کە وەك خوشك تەماشا کرێ. (٤) (ا) nun . (ب) ناوێکە بۆ بانگ کردنی " nun " یك.
(٤) شتێکی هاوتوخم و هاوشێوەی بە مێ دانراوە: ***( ~ ships )*** .
(٥) [British]، سەرەك پەرستار یا نەخۆشەوان؛ سستەر.
(٦) [Colloq.]، ئافرەت؛ کچ؛ ژن. (بۆ بانگ کردن یا ناوبردن بەکاردەهێنرێ هەندێ جار لە ڕووی سووکی یا پێکەنینەوە).
***adj.*** خوشکی؛ خوشك؛ وەك خوشك وایە؛ وەك خوشك وان.

**sisterhood** (sis′tẽr-hood´), ***n.*** (١) خوشکێتی؛ خوشکایەتی؛ پەیوەندی خوشکایەتی. (٢) ڕێکخراوێکی ئافرەتان.
(٣) ڕێکخراوێکی ئاینیی ئافرەتان (بەتایبەتی هی پەرستگا نشینەکان).

**sister-in-law** (sis′tẽr-in-lô´), ***n.*** (١) ژن خوشك. (٢) براژن.

**sisterly** (sis′tẽr-li), ***adj.*** خوشکانە؛ خوشکی: ***( ~ love )*** .
***adv.*** هەر وەك خوشکێك؛ خوشك چۆنە وەها.
**-sisterliness** ***(n.).***

**sistrum** (sis′trəm), ***n.*** ئامێرێکە دەزرنگێتەوە بە ڕاوەشاندن (میسرییەکانی کۆن بۆ مەبەستی ئاینی بەکاریان دەهێنا).

**Sisyphean** (sis´ə-fē′ən), ***adj.*** (١) سیسیفەسی: وەك "سیسیفەس" کە بەپێی ئەفسانەی یۆنانی لە دوای مردن خوداکان سزایان دا بە پاڵ پێوەنانی تلەبەردێك بۆ سەر تەوقی سەری گردێك وە هەر کە گەیشتە ئەوێ بەردەکە خل دەبووەوەو دەبوایە دیسانەوە پاڵی پێوە بنایەتەوە وە هەتا هەتا بەم جۆرە.
(٢) قورس و ناخۆش و دوایی نەهاتوو (ئەرك، کار): ***( ~ labor )*** .

**sit** (sit), ***v.i.*** (١) دانیشتن؛ قنگدانەوە.
(٢) هەڵنیشتن؛ نیشتن (مەل). (٣) کرکەوتن.
(٤) دامەزراندن یا جێگەی خۆ گرتن (پەرلەمان، دادگا، ئەنجوومەن)؛ تێدا دانیشتن وەك ئەندام:
***( to ~ in Parliament; to ~ on a jury, committee, etc.)***
(٥) کۆبوونەوە؛ گیران؛ گرتن: ***( The court will not ~ this month.)*** .
(٦) دانیشتن لە بەردەم نیگارکێش یا وێنەگردا بۆ وێنەگرتن:
***( He is ~ting for his portrait.)***
(٧) [British]، دانیشتن بۆ تاقیکردنەوە: ***( to ~ for an exam)*** .
(٨) دانیشتن؛ کارنەکردن؛ خۆلستنەوە.
(٩) لە شوێنێکدا بوون؛ کەوتنە:
***( The old house has been ~ting here for a hundred years.)***
(١٠) لێ هاتن (بەرگ)؛ بەبەرکردن؛ پێ کردن؛ شیان:
***( The hat doesn't ~ well.)***
(١١) لێ هاتن (پلەوپایە).
(١٢) لەسەر شان یا مێشك بوون؛ بار بوون بەسەرەوە:
***( care that ~s on the mind)***
(١٣) babysit .
***v.t.*** (١) دانیشاندن؛ خۆ دانیشاندن:
***( ~ yourself on that chair.)***
(٢) خۆگرتن بە سواری ئەسپەوە؛ سواربوون: ***( to ~ a horse well )*** .

sit back, پاڵ لێ دانەوە؛ پشت لێ کردنەوە؛ پێ لێ ڕاکێشان.
sit by, سەیرکردن بەبێ خۆتێهەڵقورتان.
sit down, دانیشتن؛ قنگدانەوە.
sit in on, تێدا دانیشتن؛ بەشداربوون تێدا؛ تێدا ئامادە بوون:

***( to sit in on a class )***

**sit on (*or* upon),** (١) ئەندام بوون تێدا (ئەنجوومەنی سوێندخۆران، لیژنە) ***( to sit on a committee )*** .
(٢) [Colloq.]. پنیەستکردن؛ کپکردنەوە؛ شاردنەوە؛ ئاشکرا نەکردن؛ کردن بە ژێرەوە (دەنگوباس). (٣) [Colloq.]، بە توندی سەرزەنشتکردن.

**sit out,** (١) چاوەڕێ کردن یا مانەوە هەتا دوایی هاتن؛ نەجوولان تا کۆتایی شتەکە: ***( to sit out a speech, storm, etc.)*** .
(٢) زیاتر دانیشتن لە؛ زۆرتر مانەوە لە.
(٣) دانیشتن و تێدا بەشدار نەبوون (هەڵپەرکێ، یاری).

**sit tight,** کرکەوتن مەجان؛ چاوەڕێ کردنی دوایی هاتنی شتێک و نەجوولان؛ نەبزوان؛ خۆڕاگرتن

**sit up,** (١) بە قنگەوە دانیشتن. (٢) بە ڕێکی یا ڕەپی دانیشتن.
(٣) نەنوستن هەتا درەنگتر لە (یا دوای) کاتی نوستنی ئاسایی.
(٤) ووریابوونەوە؛ ڕاچڵەکین؛ داچڵەکین.

**sitar** (sitar), ***n.*** سیتار ئامێرێکی مۆسیقی هیندییە.

**sit-com** (sit′kəm′), ***n.*** = situation comedy.

**sit-down-strike** (sit′down′), مانگرتنی دانیشتن:
مانگرتنێکە بریتییە لە دانیشتنی کرێکارەکان لە کارگەکەیانداو بەجێ نەهێشتنی هەتا جێبەجێکردنی داواکانیان. (هەروەها "sit-down" ).

**site** (sīt), ***n.*** شوێن خانوو؛ شوێنی ڕووداوی شتێک؛ شوێنێکی دانراو بۆ دروستکردنی خانوو یا پرۆژەیەک؛ جێ؛ جێگە:
***( a camp ~ ; a building ~ ; a prehistoric burial ~ ; a launching ~ ).***

***v.t.*** لە شوێنێکدا دروستکردن یا دامەزراندن.

**sith** (sith), ***adv., conj., prep.*** [Archaic], = since.

**sit-in** (sit′in′), ***n.*** مانگرتن بە دانیشتن لەو دەزگایەدا کە مانگرەکان تێیدا دەژین یا کاردەکەن.

**sito-** (sī′tō, sī′tə), ***Also*** sitio-, پێشگرێکە بە مانای: خواردەمەنی؛ خواردن ***(sitophobia )***

**sitology** (sī-tol′ə-ji), ***n.*** خواردەمەنی و خواردنناسی؛ زانستی خواردەمەنی و خواردنی ڕێکوپێک.

**sitomania** (sī′tə-mā′ni-ə), ***n.*** نەخۆشی زۆر حەز لە خواردن کردن.

**sitophobia** (sī′tə-fō′bi-ə), ***n.*** ترسی خواردەمەنی (نەخۆشی).

**sitten** (sit′′n), *obsolete past participle of* sit.

**sitter** (sit′ẽr), ***n.*** مریشکە بەکڕ.

**sitting** (sit′iŋ), ***n.*** (١) دانیشتن؛ شێوەی دانیشتن.
(٢) کۆبوونەوە؛ کۆڕ.
(٣) ماوەی دانیشتن؛ دانیشتنێک (بۆ ماوەیەکی تایبەتی):
***( He read the story in two ~s. )***
(٤) (ا) کرکەوتن (ب) ژمارەی ئەو هێلکانەی مریشکێک لەسەریان کڕ دەکەوێ.
(٥) کورسی کڵێسە.

***adj.*** (١) کڕ؛ بەکڕ؛ کرکەوتوو: ***( a ~ hen )*** .
(٢) لەکاتی کاربەدەستیدا (دادپرس)؛ لە کاتی فەرمانبەرێتیدا: ***( a ~ judge)*** .
(٣) بە ئاسانی نیشان لێ گیراو یا لێ دراو؛ نەجوولاو: ***( a ~ target )***
(٤) هی دانیشتن: ***( a ~ position )*** .

**sitting duck,** [Colloq.], نیشانی ئاسان (مرۆڤ، شت)؛ نێچیری ئاسان

**sitting room,** دیوەخان؛ ژووری دانیشتن.

**situate** (sich′ōō-it), ***adj.*** = situated.

***v.t.*** (١) شوێن بۆ دانان؛ خستنە جێیەکی تایبەتییەوە؛ خستنە.
(٢) خستنە دۆخێک یا بارێکی تایبەتییەوە.

**situated** (sich′ōō-āt′id), ***adj.*** (١) کەوتووەتە؛ لەوێدایە؛ کەوتووەتە شوێنێکی تایبەتییەوە: ***( The village is ~ in a valley.)*** .
(٢) لە دۆخێک یا بارێکی تایبەتیدایە:
***( Having three children and little money, she is badly ~ .)***

**situation** (sich′ōō-ā′shən), ***n.*** (١) شوێنی شتێک (ئەگەر بەراوورد کرێ لەگەڵ شتی تردا)؛ ئەو شوێنەی شتێکی تێدایە.
(٢) شوێن؛ جێ؛ جێگا. (٣) هەڵوێست. (٤) بار؛ دۆخ؛ چۆنێتی؛ چۆنێتی بار.
(٥) باری ڕووداوەکانی چیرۆکێک یا شانۆنامەیەک. (٦) کار؛ پلەوپایە؛ ئیش.

**situation comedy,** زنجیرە بەرنامەیەکی قۆشمەی تەلەفزیۆن یا ڕادیۆیە کە قۆشمەیییەکەی لە پەیوەندیی و ڕووداوەکانی بەینی کەسەکانی بەرنامەکە یا چیرۆکەکەدایە. (هەروەها "sit-com" ).

**situs** (sī′təs), ***n.*** شوێن (بەتایبەتی شوێنی ئاسایی ئەندامێکی لەش یا ڕووەک)؛ جێ؛ جێگە.

**sitz bath** (sits), (١) گەرماوی دانیشتن: گەرماوێکە مرۆڤ تیا دادەنیشێ هەتا ئاوقەدی بۆ مەبەستی پزیشکەوانی.
(٢) گەرماو کردن لەم جۆرە حەوزە بچووکەدا.

**six** (siks), ***adj.*** شەش.

***n.*** (١) شەش. (٢) شتێکی شەش بەشی یا پارچەیی.

**at sixes and sevens,** [Colloq.], تێکەڵ‌وپێکەڵ؛ شێواو.

**sixfold** (siks′fōld′), ***adj.*** (١) شەش بەشی؛ شەش پارچەیی.
(٢) شەش ئەوەندە.

***adv.*** شەش ئەوەندە

**six-footer** (siks′foot′ẽr), ***n.*** کەسێکی شەش پێ باڵا.

**six-gun** (siks′gən), ***n.*** = revolver.

**six-pack** (siks′pak), ***n.*** پاکەتێک خواردنەوەی شەش قاپی یا قوتوویی (بەتایبەتی بیرە).

**six-pence** (siks′pəns), ***n.*** [British], (١) شەش "پێنس".
(٢) پارەیەکی شەش "پێنس"ییە.

**six-penny** (siks′pen′i, siks′pən-i), ***adj.*** (١) بە شەش "پێنس"ە؛ بایی شەش "پێنس"ە. (٢) هەرزانبەها؛ هەرزان.

**six-shooter** (siks′shōōt′ẽr), ***n.*** شەش تیر؛ دەمانچەی بەکرەدار. (هەروەها "revolver" ).

**sixteen** (siks′tēn′), ***adj. & n.*** شانزە.

**sixteenth** (siks′tēnth′), ***adj.*** (١) شانزەهەم؛ شانزەیەم.
(٢) شانزە یەک.

***n.*** (١) شانزەهەم؛ شانزەیەمین. (٢) شانزە یەک.

**sixteenth note,** ئاوازی شانزەیەکی: ئاوازێکی کورتی مۆسیقایە کە شانزەیەکی کاتی ئاوازێکی تەواوی پێ دەچێ. (هەروەها "semiquaver").

**sixth** (siksth), ***n. & adj.*** (١) شەشەم؛ شەشەمین. (٢) شەش یەک.

**sixthly** (siksth′li), ***adv.*** شەشەم (ژمارەی لیستە).

**sixth sense,** هەستی شەشەم؛ توانای لەخۆوە هەستپێکردن یا پێ زانین؛ توانای هەڵهێنان.

**sixtieth** (siks′ti-ith), ***n. & adj.*** (١) شەستەم؛ شەستەمین.
(٢) شەست یەک.

**sixty** (siks′ti), ***n. & adj.*** شەست.

**the sixties,** شەستەکان؛ لە بەینی شەست و شەست و نۆدا (تەمەن، سەدە، چەرخ).

**sixty-four dollar question,** [Colloq.], گرنگترین و گرانترین پرسیار.

**sizable, sizeable** (sīz′ə-b'l), ***adj.*** گەورە؛ قەبارەدار؛ زۆر (هەند، ژمارە)؛ زل.

-**sizableness** ***(n.)***; **sizably** ***(adv.)***.

**sizar** (sīz′ẽr), ***n.*** قوتابی یارمەتی (پارە) پێدراو لەلایەن زانکۆوە (زانکۆی کامبرج).

**size** (sīz), ***n.*** (١) قەبارە؛ قەوارە؛ بارست؛ بارستایی؛ گەورەیی؛ قەبەیی؛ زلی؛ ئەندازە. (٢) نمرە (پێڵاو، جل‌وبەرگ)؛ ژمارە؛ پێوانە؛ ئەندازە:
***( He wears ~ nine shoes.)***

(٣) (ا) ڕادە؛ ئەندازە؛ گەورەیی:

*( The ~ of this undertaking is incredible.)*
(ب) گەورە؛ زل
(٤) توانا پێ شکان؛ هێز بەسەرا شکان:
*( The presidency is too big for the ~ of him.)*
(٥) [Colloq.]، بار یا دۆخی ڕاستەقینە؛ چۆنێتی:
*( That's the ~ of it.)*
(٦) [Obs.]. بەشی بۆ بڕاوە (خواردەمەنی).
*v.t.* (١) بە گوێرەی قەبارە یا قالبێکی تایبەتی دروستکردن.
(٢) ڕێکخستن بەپێی گەورەو بچووکی؛ بەپێی قەوارە هاوپۆل کردن.
**of a size,** یەک نمرەن؛ هاوقەبارە؛ ئەوەندەی یەک.
**size up,** (١) هەڵسەنگاندن:
*( to size up a person, situation, etc.)*
(٢) شیار؛ گونجان.
**size** (sīz), *n.* ماددەیەکی لینجە (بۆ کون و چاڵ و چۆڵی پڕکردنەوە).
(هەروەها "sizing").
*v.t.* لێدانی ئەم ماددەیە؛ پڕکردنەوە یا داپۆشین بەم ماددەیە.
**-size** (sīz), *n.* = -sized.
**sizeable** (sīz′ə-b'l), *adj.* = sizable.
**-sized** (sīzd), *Also* –size, پاشگرێکە بەمانای: نمرە ئەوەندە؛
قەبارەکەی یا ئەندازەکەی ئەوەندەیە: *(small- ~ ; life- ~)*.
**sizing** (sīz′iŋ), *n.* (١) ماددەیەکی لیقە (کون و چاڵ و چۆڵی پێ
پڕ دەکرێتەوە (هەروەها "size").
(٢) لێدانی ئەم ماددەیە؛ پڕکردنەوە بەم ماددەیە.
**sizzle** (siz′'l), *v.i.* (١) جزەجزکردن (خواردەمەنی سوورەوەکراو):
جزەجزکردن؛ قرچەقرچ لێوەهاتن؛ کسپە لێوەهاتن؛ کسپەکردن.
(٢) زۆر توورەبوون؛ شێتگیربوون؛ قوشقی بوون
*n.* جزەجز؛ جزەجز؛ قرچەقرچ؛ کسپە؛ جزە؛ قرچە
**sizzler** (siz′'l-ēr), *n.* (١) سوورکەرەوە؛ قرچە قرچ لێ هەڵسێن:
جزەجز لێ هەڵسێن. (٢) [Colloq.]، ڕۆژێکی زۆر گەرم.
**sizzling** (siz′liŋ), *adj.* جزەجزکەر؛ قرچەی دێت؛ زۆر گەرم:
*[ The food is ~ (hot).]*
**skald** (skôld, skäld), *n. Also* scald, بوێژ یا هونەرێکی
ئیسکەندیناڤی کۆن.
-skaldic *(adj.)*.
**skat** (skät), *n.* یارییەکی کاغەزە.
**skate** (skāt), *n.* (١) (ا) ئاسنێکی باریکە دەدرێ لە بنی پێڵاوی سەهۆڵ
خلیسکێ (ب) پێڵاوی سەهۆڵ خلیسکێ.
(٢) پێڵاوێکی پێچکەدارە بۆ خلیسکانی سەر ڕووی لووس.
*v.i.* خلیسکاز لەسەر بەستەڵەک بە پێڵاوی سەهۆڵ خلیسکێ وە؛
سەهۆڵ خلیسکێ کردن؛ خلیسکان لەسەر ڕوویەکی لووس بە پێڵاوی
پێچکەدارەوە
**skate on thin ice,** لە بارێکی ناسک و مەترسیدار و شلۆقدا بوون.
**skate** (skāt), *n.* جۆرە ماسییەکی دەریایی پانکەڵەی پەڕە پانی کلک
درێژە لە توخمی " ray ".
**skate** (skāt), *n.* [Slang], (١) ئەسپێکی پیری پەککەوتوو؛
ئەسپێکی قۆڵتر (٢) کەسێکی هیچ و پووچ و بێ بایەخ؛ کەسێکی بە چاوی سووک
تەماشاکراو.
**skate-board** (skāt-bôrd), *n.* تەختەخلیسکە: تەختەیەکی
پێچکەدارە بۆ خلیسکان لەسەر شەقام و شۆستە و ڕووی تەخت.
**skater** (skāt′ēr), *n.* (١) سەهۆڵ خلیسکێکەر؛ کەسێکە لەسەر ڕووی
لووس (وەک شەقام) دەخلیسکێ بە پێڵاوی پێچکەدارەوە یا بەسەر تەختەی
پێچکەدارەوە (٢) water strider
**skating rink,** یاریگای سەهۆڵ خلیسکێ؛ مەیانی سەهۆڵ خلیسکێ
(لە ژوورەوە)
**skatole, skatol** (skat′ōl), *n.* ئاوێتەیەکی بۆگەنە لە بۆگەن کردنی
پرۆتینەوە پەیدا دەبێ (لە ڕیخۆڵە و گووو هەندێ ڕووەکدا هەیە و بە دەستکردیش
دروست دەکرێ).
**skean** (skēn), *n.* خەنجەری ئێرلەندی و ئوسکوتلەندی.
**skedaddle** (ski-dad′'l), *v.i.* [Colloq.], ڕاکردن؛ تێ تەقان؛
بە پەلە دەربازبوون.
*n.* [Colloq.], ڕاکردن؛ تێ تەقان؛ بە پەلە دەربازبوون.
**skee** (skē), *n. & v.i.* = **ski.**
**skeet** (skēt), *n.* جۆرێکە لە **trapshooting**.
**skeg** (skeg), *n.* (١) بەشی پشتەوەی ئیرگەی ژێر بەلەم و کەشتی بە درێژی؛
ئەو بەشەی ئەم ئیرگەیە کە ستوونی دەستاژووی کەشتی لەسەر ڕاوەستاوە
(٢) پەڕەیەکە لە دواوەی دیوی ژێرەوەی تەختەی شەپۆل خلیسکێی
کەنار دەریا.
**skein** (skān), *n.* (١) کەلافە دەزوو؛ کلافە.
(٢) کاکۆڵ؛ تیتک؛ گێسوو؛ تۆپەڵە موو؛ کلافەی کلکی ئەسپ.
(٣) پۆلە مەلی کێوی.
**skeletal** (skel′ə-t'l), *adj.* تایبەتی بە پەیکەری ئێسک؛
هی ئێسکبەند؛ ئێسکبەندی؛ لە ئێسکە پەیکەر دەچێ.
**skeleton** (skel′ə-t'n), *n.* (١) پەیکەری ئێسک؛ ئێسکە پەیکەر؛
کۆئەندامی ئێسکی؛ ئێسکبەند؛ ئێسک. (٢) قاوغ؛ قالوز؛ قاقلە؛ قاپۆر.
(٣) کەسێک یا گیاندارێکی ڕەقەڵە؛ کەسێکی پووکاوە؛ کەسێکی لەڕولاواز.
(٤) چوارچێوە (کەشتی، خانوو، ...هتد)؛ چوارچێوەی بۆش.
(٥) نەخشە (چیرۆک، پرۆژە)، پیلان.
*adj.* (١) ئێسکبەندی؛ وەک ئێسکەپەیکەر؛ لە قاوغ دەچێ.
(٢) زۆر کەم؛ پووکاوە؛ هیچ نەماو.
(٣) تەنها چوارچێوەکەی ماوە؛ ژمارەکەی زۆر کەم کراوەتەوە: *(a ~ staff)*
**a skeleton at the feast,** کەسێکە یا (ڕووداوێکە) کە بەری دڵی خەڵک
دەگرێ لە کاتێکی خۆشیدا؛ کەسێکە کە هۆی تاریکی و ناخۆشییە لە
ئاهەنگێکدا.
**a skeleton in the closet,** شتێکی ئابڕووبەر و شەرمەزارییە کە لە
خەڵک دەشارێتەوە (دەربارەی ئەندامی خێزانێک، دەزگایەک، ...هتد).
**skeletonize** (skel′ə-t'n-īz′), *v.t.* (١) پووکاندنەوە؛ لەڕولاوازکردن؛
ووشک کردنەوە (لەش). (٢) نەخشەکێشان بە کورتی.
(٣) ژمارە کەمکردنەوە (فەرمانبەرانی دەزگایەک).
**skeleton key,** ڕەقەڵە کلیل: کلیلێکە کە گەلێک قفڵ دەکاتەوە.
**skep** (skep), *n.* (١) زەمیلە یا سەبەتەیەکی خڕ.
(٢) پڕ زەمیلە یا سەبەتەیەکی وەها.
(٣) پوورە هەنگ (بەتایبەتی هی پووش)؛ پلوورە هەنگ؛ پوورە.
**skeptic** (skep′tik), *n.* (١) ئەندامی ڕێکخراوێکی فەلسەفەیی یۆنانی
کۆنی بێ بڕوا یا بەگومان (دەربارەی زانینی شتەوە).
(٢) کەسێکی بێ بڕوا (فەلسەفە)؛ کەسێکی دوودڵ یا گوماندار (فەلسەفە).
(٣) کەسێکی بێ باوەڕ، گوماندار، یا دوودڵ.
(٤) کەسێکی بێ بڕوا (ئاین بەتایبەتی خاچ پەرستی).
**skeptical** (skep′tə-k'l), *adj.* (١) بێ بڕوای فەلسەفەیی؛
هی گومانداران (فەلسەفە). (٢) بێ بڕوا؛ دوودڵ؛ بەشک؛ گوماندار؛ بەگومان؛
بەدگومان. (٣) بێ بڕوا (ئاین).
**skepticism** (skep′tə-siz′m), *n.* (١) گومانداری (فەلسەفە):
بیروباوەڕێکی فەلسەفەییە کە دەڵێت دەبێ بە گومانەوە سەیری ڕاستێتی
هەموو جۆرە زانین و زانیارییەک بکەین.
(٢) بێ بڕوایی؛ دوودڵی؛ بەگومانی؛ شک.
(٣) بێ باوەڕی (بە ئاین بەتایبەتی خاچ پەرستی)؛ بێ بڕوایی.
**skerry** (sker′i), *n.* دوورگەیەکی بەردەڵانی بچووک؛
بەرد یا تیرەی بەردینی تەنکاوی کوێ دەریا.
**sketch** (skech), *n.* (١) نیگار؛ وێنەی بە دەست کراو؛ گەڵاڵەی نیگار.
(٢) نەخشە (پەڕتووک، پرۆژە)؛ گەڵاڵە. (٣) (ا) چیرۆک یا ووتارێکی کورت؛
باسێکی کورت. (ب) پارچە ئاوازێکی کورت (بەتایبەتی هی پیانۆ)

(ج) پەرنەیەك یا شانۆنامەیەكی كورتی قۆشمە یا لاقرتێیی.
(٤) [Colloq.]، كەسێكی سەیر خۆش؛ كەسێكی نەنتیكە.
*v.t.* نەخشەكێشان؛ بەكورتی باس كردن؛ گەلاڵەكردن.
*v.i.* نیگاركێشان
**sketch-book** (skech′book′), *n.* (١) دەفتەری نیگاركێشان.
(٢) دەفتەری باسی وێژەیی كورت (چیرۆك؛ شانۆنامەی كورت).
**sketchy** (skech′i), *adj.* (١) گەلاڵەیی؛ نەخشەیی؛ سەرەتایی.
(٢) ناتەواو؛ ڕووكەشی.
-**sketchily** *(adv.)*; **sketchiness** *(n.)*.
**skew** (skū), *v.i.* (١) خواربوون؛ لادان؛ بەلادا ڕۆیشتن.
(٢) [Dial.]، بە تیلەی چاو سەیركردن؛ بە لایەكی چاو تەماشاكردن.
*v.t.* (١) خواركردن؛ لابەلاكردن؛ بەلادابردن.
(٢) شێواندن؛ چەوت كردن؛ تێكدان.
*adj.* (١) خوار؛ لار؛ لابەلا. (٢) شێواو؛ تێكدراو؛ چەوت. (٣) لابەلا (ئەندازە).
*n.* (١) لاری؛ خواری. (٢) بەشی لار یا خوار؛ پێچ.
**skew arch,** تاقی خوار (خانووسازی).
**skew-back** (skū′bak′), *n.* ڕوویەكی لارە كە پایەی تاقی كەوتووەتە سەر.
**skew-bald** (skū′bôld′), *adj.* پەڵەپەڵە (ئەسپ)؛ پنكە پنكە؛ بەڵەك.
**skewer** (skū′ēr), *n.* شیشی كەباب؛ سیخ.
*v.t.* لە شیش دان؛ بە شیشەوە كردن.
**skewness** (skū′nis), *n.* (١) لاری؛ خواری؛ چەوتی.
(٢) لاری (ژمێرەكاری)؛ خواری.
**ski** (skē), *n.* پێڵاوی بەفرەخلیسكێ (كە بریتییە لە پارچەیەك دار یا كانزای نەختێك درێژ كە پێڵاوی پێوە دەبەسترێ و بەفرەخلیسكێی پێ دەكرێ)
*v.i.* بەفرەخلیسكێ كردن.
**skiagram** (skī′ə-gram′), *n. Also* **skiagraph,** وێنەی بە تیشكی ئێكس وەرگیراو؛ وێنەی سێبەر یا تارمایی.
**skiagraphy** (skī-ag′rə-fi), *n.* وێنەگرتن بە تیشكی ئێكس؛ وێنەی سێبەر یا تارمایی گرتن.
**skiascope** (skī′ə-skōp′), *n.* = **retinoscope.**
**skiascopy** (skī-as′kə-pi), *n.* = **retinoscopy.**
**skid** (skid), *n.* (١) تەختەی (یا جووتە تەختەی) باری قورس لەسەر خل كردنەوە (٢) چوارچێوەی پێچكەداری بار گواستنەوە.
(٣) (*pl.*)، چوارچێوەیەكی تەختەیە دەنرێ بە قەد كەشتییەوە بۆ پاراستنی لەكاتی بارداگرتندا. (٤) ئامێری خلیسكانی فڕۆكە لەكاتی نیشتنەوەیدا.
(٥) ئامێری داخستن یا قفڵدانی ڕەوڕەوەی ئۆتومبێل و خلیسكاندنی پێچكەكانی. (٦) خلیسكان (ئۆتومبێل، مرۆڤ)؛ هەڵخلیسكان.
*v.t.* (١) داخستن یا قفڵدانی ڕەوڕەوەی ئۆتومبێل و خلیسكاندنی ئۆتومبێلەكە.
(٢) (ا) گواستنەوە بە چوارچێوەی پێچكەدار.
(ب) خلیسكاندن لەسەر تەختە (بار)
*v.i.* (١) خلیسكان بەلادا (وەك ئۆتومبێل لەسەر سەهۆڵ):
*( The car ~ded ten feet.)*
(٢) خلیسكانی پێچكەی ئۆتومبێل لەبەر نەسووڕانەوەی پێچكەكان.
(٣) خلیسكان (فڕۆكە). (٤) كەوتنەخوارەوە بە توندو بە خێرا.
**on the skids,** [Slang], لە بەناخ چووندایە؛ لە شكستیدایە؛ لە نشوستیدایە.
**skiddoo** (ski-dōō′), *v.i.* [Slang]. ڕۆیشتن؛ برۆ!؛ لاچۆ لێرە!
**skid fin,** پەڕەكەی تەنیشتی باڵی سەرەوەی فڕۆكەی " **biplane** " (بۆ هاوسەنگی).
**skid-proof** (skid′prōōf′), *adj.* ناخلیسكێ (پێچكەی ئۆتومبێل)؛ شتی لەسەر ناخلیسكێ (ڕێگە).
**skid row,** [Slang], گەڕەكی دەربەدەران: ناوچەیەكە خەڵكی وێڵ و خانە بە كۆمەڵ و عەرەق خۆرو ئاوارەی تێدا دەژی.
**skier** (skē′ēr), *n.* بەفرەخلیسكێكەر.

**skiff** (skif), *n.* (١) بەلەمێكی سەوڵی سووك و بچووكە.
(٢) بەلەمێكی بایەوانی بچووكە.
**skiing** (skē′iŋ), *n.* بەفرەخلیسكێ.
**skijoring** (skē′jôr′iŋ, skē-jō′riŋ), *n.* بەفرەخلیسكێ بە ڕاكێشان: وەرزشێكە بریتییە لە ڕاكێشانی بەفرە خلیسكێكەر بە ئەسپ یا ئۆتومبێل.
**ski jump,** (١) بازدی بەفرەخلیسكێ: بازدێكە بەفرەخلیسكێكەر دەیدات.
(٢) لێژگە یا سەر بەرەوخوارەی ئەم بازدە.
**ski lift,** ئەسانسێر (یا بەرزكەرەوەی) بەفرەخلیسكێ: بۆ گواستنەوەی بەفرەخلیسكێكەران بۆ سەر تەوقەسەری گردو شاخی بەفرەخلیسكێ (پێشی دەوترێ " **ski tow** ").
**skilful** (skil′fəl), *adj.* = **skillful.**
**skill** (skil), *n.* (١) كارامەیی؛ شارەزایی؛ پسپۆری؛ كارسازی؛ وریایی.
(٢) [Obs.]، زانیاری؛ زانین؛ تێگەیشتوویی؛ تێگەیشتن.
*v.i.* گرنگ بوون؛ قەی كردن.
**skilled** (skild), *adj.* (١) كارامە؛ شارەزا؛ كارزان؛ بزان؛ لێهاتوو (لە پیشەیەكدا). (٢) كارامەیی دەوێ؛ پێویست بە كارسازی یا شارەزایی دەكات: *( ~ labor )* .
**skillet** (skil′it), *n.* تاوە.
**skillful, skilful** (skil′fəl), *adj.* كارامە؛ كارساز؛ شارەزا؛ قاڵ.
**skilling** (skil′iŋ), *n.* پارەیەكی ئەسكەندیناڤی كۆنی كەم بایەخە (وەك فلس).
**skim** (skim), *v.t.* (١) سەرتوێژ یا چەوری لێ گرتن (شیر)؛ لێ لابردن:
*( He ~med the milk of its cream.)*
(٢) لێ گرتن (كەف و كوڵ و پیسایی)؛ لێ لابردن.
(٣) داپۆشین (بە چینێكی تەنك): *( a pond ~med with ice)* .
(٤) چاو پیاخشاندن؛ بە پەلە خوێندنەوە:
*( to ~ a magazine, book, etc.)*
(٥) (ا) بەخێرا بەسەردا ڕۆیشتن یا خلیسكان؛ پیاخشاندن؛ بە ئاستەم بەركەوتن. (ب) هاویشتن بە جۆرێك كە بە ئاستەم بەر سەرەكەی بكەوێ یا بخلیسكێ بەسەریا (بەرد بەسەر ئاو یا سەهۆڵدا):
*( He ~med a stone across the pond.)*
*v.i.* (١) پێداخشان؛ بەسەردا خشان؛ بە خشپە بەسەردا تێپەڕبوون؛ بەسەردا كشان؛ ڕووشان. (٢) ( **~ over; ~ through** )، چاو پیاخشاندن (نووسراو)؛ بە پەلە خوێندنەوە: *( to ~ over an article)* .
*n.* (١) سەرتوێژ لێ گرتن یا لێ لابردن. (٢) شتی سەرتوێژ لێ گیراو (وەك شیر).
(٣) توێژاڵ؛ توێژی تەنك؛ سەرتوێژ.
(٤) [Obs.]، كەفی پیس؛ پیسی سەرئاوكەوتوو.
*adj.* (١) سەرتوێژ لێ گیراو یا لابراو: *(~ milk)* .
(٢) لە شیری سەرتوێژ لێ گیراو دروستكراوە: *(~ cheese)*
**skimble-scamble** (skim′b'l-skam′b'l), *adj.* پچڕپچڕ بێ مانا؛ هەلەق مەلەق.
**skimmer** (skim′ēr), *n.* (١) كەفگیر؛ كەوگیر.
(٢) (ا) باڵندەیەكی كەنارەریایی باڵ درێژی دەنووك مقەستییە لە فڕیندا بەسەر ئاوەكەدا دەكشێ بە شوێن خواردندا. (ب) **water strider**
(٣) شەپقەیەكی لێوار پانە. (٤) جۆرێكە لە كراسی كراوە.
**skim milk,** شیری چەوری لێ گیراو؛ شیری سەرتوێژ لێ لابراو؛ شیری ڕوون. (هەروەها " **skimmed milk** ").
**skimming** (skim′iŋ), *n.* [pl.], كەف و كوڵی لە شلە گیراو؛ سەرتوێژی لێ لابراو یا گیراو.
**skimp** (skimp), *adj.* [Colloq.], كەم؛ بە ئاستەم بەش دەكات.
*v.t.* [Colloq.], (١) بە كەم و كوڕی و خراپی دروستكردن لەبەر پارەپیسی.
(٢) پیسكەیی كردن؛ ڕەزیلی كردن؛ زۆر دەست بە پارەوە گرتن؛ بەرچاوتەنگی كردن
*v.i.* [Colloq.], زۆر دەست بە پارەوە گرتن؛ پیسكەیی كردن؛ كەم خەرج كردن؛ بەرچاوتەنگی كردن:

***( to ~ on the budget; We ~ed to save money.)***

(ووشەی " scrimp " یش ببینە).

**skimpy** (skim′pi), *adj.* (١) کەم؛ کەم و کورِ؛ ناتەواو
(٢) نەستەە؛ بە چاوتەنگ؛ رەزیل؛ پوولەکی.

**-skimpily** *(adv.)*; **skimpiness** *(n.)*.

**skin** (skin), *n.* (١) پێست؛ چەرم. (٢) کەوڵ؛ پێستە
(٣) تەیلە؛ تونخ؛ تونکل؛ تونك یا بەرگی کەشتی و فرۆکە.
(٤) کوندە؛ مەشکە؛ توورەکە یا کیسەی چەرم.
(٥) [Slang] کەسێکی پیسکە یا رەزیل؛ پوولەکی؛ بەرچاوتەنگ.
(٦) [Slang]. دەسبڕ؛ ساختەچی.

***v.t.*** (١) کەوڵ کردن؛ پێست داماڵین؛ پێست گرتنەوە.
(٢) بە پێست داپۆشین. (٣) تونکل لێکردنەوە؛ پاکردن؛ تونك لێکردنەوە.
(٤) [Slang]. دەسبڕین؛ رووتکردنەوە؛ پارە لێ کێشانەوە؛ ساختەلێکردن.
(٥) پێست برینداركردن؛ برین؛ تونك رووشاندن یا بریندارکردن.

***v.i.*** (١) گۆشتەوزوون هێنانەوە؛ سارێژبوون؛ هاتنەوەیەکی برین
(٢) تونك فرێدان؛ تونك لێ بوونەوە؛ کاژ فرێدان.
(٣) [Slang]. ( ~ out ). دەربازبوون؛ راکردن؛ بزی دەرچوون؛ تێ تەقاندن.

**be no skin off one's back,** [Slang], کار تێ نەکردن؛ باك نەبوون؛ دەربەست نەهاتن

**by the skin of one's teeth,** بە ئاستەم؛ بە حاڵ:

***( We escaped capture by the skin of our teeth.)***

**get under one's skin,** (١) توورەکردن؛ زۆر پەستکردن؛ وەڕس کردن؛ ڕق هەڵساندن (٢) بوون بە خولیا؛ زۆر خووپێوەگرتن.

**have a thick skin,** بەهیچ پەست نەبوون؛ بەرگەی هەموو رەخنەو هێرشێك گرتن؛ بەهیچ توورە نەبوون؛ هەست ناسك نەبوون

**have a thin skin,** دڵ ناسك؛ زوو پەست بوون؛ بەرگەی رەخنەو هێرش نەگرتن.

**in (*or* with ) a whole skin,** [Colloq.], بەبێ برینداری؛ بە ساغی.

**save one's skin,** خۆ رزگارکردن (لە مردن یا زیانێکی گەورە)؛ لە مردن رزگاربوون.

**skin alive,** (١) کەوڵ کردن بە زیندوێتی؛ چەرمی سەر گرتنەوە.
(٢) [Colloq.]، بەتوندی رەخنەلێگرتن؛ سزادان؛ سەرزەنشتکردن.
(٣) [Colloq.]، باش بەزاندن؛ بۆرپێدان؛ لێ بردنەوە.

**skin-deep** (skin′dēp′), *adj.* (١) قووڵ نییە (برین، برین)؛ تەنها هەر پێستەکەی بریوە یا پیاچووە: ***(a ~ cut)*** .
(٢) قووڵ نییە؛ تەنك؛ رووکەش: ***(Beauty is ~ .)*** .

***adv.*** رووکەشی؛ بە رووکەشی کراو.

**skin-dive** (skin′dīv′), *v.i.* مەلەکردن لەژێر ئاودا.

**skin diving,** مەلەی ژێر ئاو (بە ئامێری هەناسەدانەوە).

**-skin diver** *(n.)*.

**skin flick,** [Slang], فیلمی رووت

**skin-flint** (skin′flint), *n.* = **miser.**

**skin-full** (skin′fool′), *n.* (١) پڕ مەشکەیەك.
(٢) [Colloq.]، ئەوەندەی کە پیاو بۆی بخورێتەوە (عەرەق).
(٣) [Colloq.]، زۆر؛ هەندێکی زۆر؛ ئەوەندەی کە بەرگەی بگیرێ.

**skin game,** [Colloq.], (١) قومارێك یا یارییەکە کە لەسەر گزی بەندە.
(٢) دەسبڕی؛ ساختە؛ گزی؛ قوماربازی؛ جامبازی؛ فریوبازی.

**skin graft,** پینەکردنی پێست؛ پینەکردنی بەشێکی لەش بە پێستی بەشێکی تری بە نەشتەرکاری

**skink** (skiŋk), *n.* شەوگەڕ؛ گیاندارێکی ناوچە گەرمەکانە لە توخمی مارمێلکە

**skinned** (skind), *adj.* پێستەکەی فلانە رەنگە:

***( a dark- ~ person )***

**skinner** (skin′ẽr), *n.* (١) پێستە خۆشکەر؛ پێستە فرۆش؛ کەوڵکەر (٢) دەسبڕ؛ ساختەچی؛ قومارباز؛ فریوباز.

(٣) [Colloq.]، قاترچی؛ ئێستروان؛ قەتارچی.

**skinny** (skin′i), ***adj.*** (١) پێستی؛ لە پێست دەچێ؛ پەردەیی (لەش).
(٢) لەڕ؛ رەقەڵە؛ لەڕولاواز؛ لات؛ ڕیپوەڵە؛ سیسەڵە.

**-skinniness** *(n.)*.

**skinny-dip** (skin′i-dip′), *v.i.* [Colloq.], مەلەکردن بە رووتی.

**-skinny-dipper** ***(n.)***; **skinny-dipping** ***(n.)***.

**skin test,** پێست تاقیکردنەوە بۆ هەستیاری (پزیشکەوانی).

**skin-tight** (skin′tīt′), *adj.* تەسك (جل و بەرگ)؛ تەنگ.

**skip** (skip), *v.i.* (١) بازدان؛ لە خۆشیدا بە قونەقون رۆیشتن بەرێوە؛ قونەکردن (لە خۆشیدا): ***( The girls ~ped gaily by.)*** .
(٢) بەسەردا بازدان یا هەڵبەزینەوە.
(٣) پەڕاندن؛ بوواردن؛ بەسەردا تێپەڕبوون.
(٤) پۆل پەڕاندن (قوتابخانە)؛ دەرچوواندن بە پۆل پەڕاندنەوە.
(٥) [Colloq.]، بە پەلەو بەدزییەوە ڕاکردن؛ تێ تەقاندن؛ بە دزییەوە بۆ دەرچوون.

***v.t.*** (١) بەسەردا بازدان؛ بازدان.
(٢) پەڕاندن؛ بەسەردا تێپەڕبوون (بەبێ بینین، سەرنج پێدان، یا خوێندنەوە)؛ بوواردن. (٣) بەسەردا تێپەڕاندن. (٤) [Colloq.]، بە پەلەو بە دزییەوە ڕاکردن؛ بۆ تێ تەقاندن؛ دەربازبوون.

***n.*** (١) قونەقون کردن (لە خۆشیدا)؛ لە خۆشیدا بە قونە رۆیشتن بەرێوە.
(٢) پەڕاندن؛ بوواردن؛ بەسەردا تێپەڕبوون بەبێ سەرنج پێدان.

**ski pants,** پانتۆڵی بەفرەخلیسکێ (لە رانك و شەرواڵی کوردی دەچێ).

**skip-jack** (skip′jak′), ***n.*** (١) ماسی بازدەر: چەند جۆرە ماسییەکن بازد ددەن بەسەر ئاوداو لەسەر ئاو یاری دەکەن. (٢) قالۆنچەی خۆهەڵگێڕەوە

**skipper** (skip′ẽr), ***n.*** (١) بازدەر (مرۆڤ، شت).
(٢) **saury** . (٣) پەپوولەیەکی بچکۆلەی تیژە. (٤) جانەوەری بازدەر

**skipper** (skip′ẽr), ***n.*** (١) ئاژووەری کەشتی بچووك؛ ڕانەری بەلەم و کەشتی بچووك. (٢) پێشڕەو؛ رابەر؛ سەرۆك؛ سەردار؛ سەرگەورە.

**skirl** (skũrl), ***v.t. & v.i.*** [Scot. & Dial.], زوڕنا لێدان؛ دەنگی ناسازی وەك زوڕنا لێوە هاتن.

***n.*** دەنگی زوڕنا؛ دەنگێکی ناسازی وەك زوڕنا.

**skirmish** (skũr′mish), ***n.*** (١) بەیەکداهاتن؛ وردە شەڕ؛ بەرەنگاری یەکتر بوون و بەیەکدادان (پەلی لەشکر)؛ لێدان.
(٢) کێشمەکێش؛ مشتومڕ؛ ناکۆکی؛ دەمقرە.

***v.i.*** (١) وردە شەڕکردن (لقی لەشکر)؛ بەیەکدادان؛ لێکدان.
(٢) مشتومڕ؛ دەمقرە لەگەڵ کردن.

**-skirmisher** ***(n.)***.

**skirr** (skũr), ***v.i.*** (١) هەڵفڕین؛ بە پەلە ڕاکردن یا هەڵفڕین؛ تێ تەقاندن؛ دەربازبوون: ***( Birds ~ed off from the bushes.)***
(٢) بە پەلە رۆیشتن؛ خێرا رۆیشتن؛ فڕین؛ چوون.

***v.t.*** (١) بۆ گەڕان؛ بە شوێندا گەڕان؛ سۆراخ بۆ کردن؛ سووڕانەوە.
(٢) (ا) بەسەردا تێپەڕین (بە تیژی). (ب) بەسەردا تێپەڕاندن یا بردن.

***n.*** ووڕەووڕ؛ فڕەفڕ؛ ووڕە

**skirt** (skũrt), ***n.*** (١) چمکی کراس و کەوا؛ ئەو بەشەی کراس و کەواو تەنوورەیە کە لە کەمەر بەخوارەوە دادەپۆشێ. (٢) تەنوورە؛ کراسی تا سەر ئەژنۆ. (٣) شتێکی شۆڕبووەوەیە کە لە تەنوورە بچێ (وەك چمکی شتی شۆڕ بووەوە لە زین). (٤) (*pl.*) قەراغ شار؛ پەراوێز؛ چمك؛ ناوچەی نزیك سنوور
(٥) [Slang]، کچ؛ ئافرەت؛ ژن.

***v.t.*** (١) بە قەراغدا درێژبوونەوە؛ دەورەدان؛ دەورگرتن.
(٢) بە دەوردا رۆیشتن (نەك بە ناودا)؛ بە قەراغدا رۆیشتن:

***( to ~ a city, the woods, etc.)***

(٣) خۆ لێ لادان (پرسیار، باسی ناخۆش)؛ بە دەوردا سووڕانەوە؛ لێ دوورکەوتنەوە: ***( The president ~ed the subject.)*** .

***v.i.*** بە دەوردا بوون یا درێژبوونەوە؛ بە قەراغیدا سووڕانەوە؛ لە قەراغەکەیدا بوون ***( The path ~s along the edge of the pond.)***

**ski run,** لیژگەی بەفرەخلیسکێ؛ ڕێڕەوی بەفرەخلیسکێ.
**skit** (skit), *n.* (١) توانج؛ توانج تێگرتن؛ قسە تێگرتن.
(٢) نووسراوێکی کورتی قۆشمە یا لاقرتێیی.
(٣) شانۆنامەیەکی کورت یا پەردەیەکی قۆشمە یا لاقرتێیی.
**ski tow,** = ski lift.
**skitter** (skit′ēr), *v.i.* (١) وەك تیر بەسەردا تێپەڕبوون (بەتایبەتی بەسەر ئاودا)؛ بە تیژی بەسەردا ڕۆیشتن؛ خلیسکان؛ خشان بەسەردا.
(٢) یاری پێ کردنی قولاپی ڕاوەماسیو ڕاوەشاندنیو ڕاتەکانی بۆ سەرڕووی ئاوەکە
*v.t.* بەسەرا خلیسکاندن؛ بەسەردا تێپەڕکردن بە تیژی.
**skittish** (skit′ish), *adj.* (١) سرك؛ تۆڕ: *( a ~ horse)* .
(٢) بەناز؛ بەنازونووز؛ مەکرباز؛ بە مەکر؛ مەکرکەر.
(٣) بێ بار؛ دوودڵ؛ پشت پێ نەبەستراو.
**skittle** (skit′'l), *n.* (١) یاری ninepins کە لە یاری bowling دەچێت.
(٢) هەر یەکێك لە نۆ نیشانەکەی ئەم یارییە.
**all beer and skittles,** هەمووی هەر خواردنەوەو ڕابواردنە؛ هەر ڕابواردنە.
**skive** (skīv), *v.t.* پێستە تاشین؛ توێ توێ کردنی پێستە.
**skiver** (skīv′ēr), *n.* (١) پێستێکی تەنکە (بۆ بەرگی پەڕتووك).
(٢) پێستە تاش؛ پێستە توێکەر.
(٣) چەقۆیەك یا شتێکی تیژە بۆ پێستە تاشین یا توێ توێ کردن.
**skivvy** (skiv′i), *n.* [Slang], (١) فانیلەی ژێرەوەی پیاوان (بەتایبەتی هی کەشتیوان). (٢) *(pl.)* دەرپێو فانیلە. (٣) کارەکەر (لەڕووی سووکییەوە).
**skoal** (skōl), *interj.* نۆش!
**skua** (skū′ə), *n.* باڵندەیەکی دەریایی گەورەی گۆشت خۆری ڕاوکەرە.
**skul-duggery** (skul-dug′ēr-i), *n.* [Colloq.], فێڵبازی؛ تەڵەکەبازی؛ زۆرزانی.
**skulk** (skulk), *v.i.* (١) خۆ مات دان؛ خۆ مت کردن.
(٢) بە ترسو لەرزەوە ڕۆیشتن؛ بە خشپە جووڵانەوە؛ بە دزییەوە گەڕان.
(٣) خۆ لە ئەرکی سەرشان دزینەوە؛ ڕاکردن لە ئەرك.
(١) (ا) کەسێکی بە خشپەو ترسو لەرز گەڕاوە.
(ب) کەسێکی ڕاکردوو لە ئەرکی سەرشان.
(٢) تاقمی گیانداری بە دزییەوە گەڕاو (بەتایبەتی ڕێوی).
**skull** (skul), *n.* (١) کاسەی سەر؛ کەللە؛ کەللەی سەر؛ قاپۆل؛ کاپۆل.
(٢) مێشك (بەتایبەتی بێ مێشکی): *( thick ~; empty ~ )* .
**skull and crossbones,** کەللەو ئێسقانی چەپو ڕاست لەیەکدراو: وێنەی کەللەیەکی سەرو دوو ئێسقانی چەپو ڕاست لەیەکدراوە کە نیشانەی مردنو مەترسییە (لە کۆندا دەکرا بە ئاڵای چەتەی دەریاییەوەو ئێستا لە دەفری ژەهر دەدرێ بۆ ئاگاداری).
**skull-cap** (skul′kap′), *n.* (١) کڵاو (بەتایبەتی هی تەسك بۆ ناومال).
(٢) تەوقە سەر (٣) جۆرە ڕووەکێکە گوڵەکەی لە کڵاوزێ دەچێ.
**skunk** (skuŋk), *n.* (١) دەڵەك
(٢) [Colloq.]، کەسێکی پیسی بۆگەنی ناپەسەند.
*v.t.* [Slang], (١) لێ بردنەوە (بەتایبەتی بە ڕێگە نەدان بە بردنەوەی هیچ خاڵێك لە یاریدا)؛ بۆڕ پێدان؛ بەزاندن. (٢) گزی کردن؛ فێڵ کردن؛ پارە نەدان.
**skunk cabbage,** کەلەرمە بۆگەنە.
**sky** (skī), *n.* (١) ئاسمان. (٢) گەردوون.
(٣) ئەوپەڕی بەرزی؛ پلەی زۆر بەرز؛ ئاسمان (مەجاز): *( reaching for the ~ )*
(٤) (ا) شینوەی ئاسمان: *( blue ~ )* .
(ب) ئاووهەوا. (٥) [Obs.] پەڵە هەور؛ هەور.
*v.t.* (١) شەق لە تۆپ هەڵدان بە ئاسماندا؛ هاویشتن بە ئاسماندا.
(٢) زۆر بە بەرزی هەڵواسینی وێنەیەك لە پیشانگادا.
**out of a clear sky,** لەپڕ؛ لە ناکاو
**to the skies,** (١) ئێجگار زۆر؛ ئەوپەڕ: *(praised to the skies )*
(٢) بۆ ئاسمان؛ بەرەو ئاسمان.
**sky blue,** شینی ئاسمانی.
-**sky-blue** *(adj.).*
**sky-borne** (skī-bôrn), *adj.* بە فڕۆکە گوێزراوە: *( ~ troops )*
**sky-cap** (skī′kap′), *n.* کۆڵ هەڵگری فڕۆکەخانە
**sky-dive** (skī′dīv), *v.i.* یاری خۆ فڕێدانە خوارەوە لە فڕۆکەوە بە پەڕەشووت (لە بەرزایی شەش هەزار پێ وە).
-**sky-diver** *(n.)*; **sky-diving** *(n.).*
**Skye terrier,** سەگێکی بچووکی باڵاو گوێ کورتی تیسك درێژە.
**sky-ey** (skī′i), *adj.* (١) [Poetic]، ئاسمانی (ڕەنگ)؛ شینی ئاسمانی.
(٢) بەرز؛ بڵند.
**sky-high** (skī′hī′), *adj.* زۆر بەرز؛ بڵند
**sky-jack** (skī′jak′), *v.t.* فڕۆکە فڕاندن بە زۆر (بەتایبەتی فڕۆکەیەك کە بە هەواوە بێ). (هەروەها " highjack ").
**skylark** (skī′lärk′), *n.* کڵاوکوڕە.
**skylight** (skī′līt′), *n.* کڵاوڕۆژنە؛ پەنجەرەی سەربان.
**skyline** (skī′līn′), *n.* (١) ئاسۆ.
(٢) دیمەنی خانووەکانی شار یا ڕیزە شاخێك بە قەد ئاسمانەوە.
**sky pilot,** [Slang], = **clergyman.**
**sky-rocket** (skī′rok′it), *n.* فیشەکەشێتە.
*v.i.* لەپڕ بەرزبوونەوە (نرخ، فرۆخت، ناوبانگ، پلەوپایە): *( The price of food has ~ed.; Home sales have ~ed.)*
*v.t.* لەپڕ بەرزکردنەوە.
**sky-scraper** (skī′skrāp′ēr), *n.* خانووی زۆر بەرز؛ باڵەخانەی سەر لە ئاسمان دەر.
**sky-ward** (skī′wērd), *adv. & adj.* بەرەو ئاسمان؛ بۆ سەرەوە.
**sky-wards** (skī′wērdz), *adv.* = **sky-ward.**
**sky-way** (skī′wā′), *n.* هێڵی ئاسمانی؛ هێڵی فڕۆکە.
**sky-writing** (skī′rīt′iŋ), *n.* (١) نووسین بە قەد ئاسمانەوە (بەهۆی هەڵمێکی باش دیار کە لە فڕۆکەیەکەوە دێتە دەرێ).
(٢) ئەو ووشانەی بەم شێوەیە دەنووسرێن.
-**sky-writer** *(n.).*
**slab** (slab), *n.* (١) تەختە بەرد؛ تاشە بەرد؛ تاتە بەرد؛ زەمینەی کۆنکریتی: *( a ~ of concrete)* .
(٢) قاشێکی پانو ئەستوور (پەنیر، کێك). (٣) توێی لە دار بڕاوە بە خڕی.
(٤) [Slang]، بنکە یا سەرشاری تۆپ هاوێژی یاری بێسبۆڵ.
*v.t.* (١) کردن بە تەختە بەرد؛ توێ توێ کردن.
(٢) توێ بڕینەوە لە دارێك بە خڕی.
(٣) تەختە ڕێژ کردن؛ زەمینە داڕشتن بە کۆنکریت.
**slab** (slab), *adj.* [Archaic], خەستو لینج *( ~ porridge )*
**slabber** (slab′ēr), *v.i. & v.t., n.* = **slobber.**
**slab-sided** (sla-sīd′id), *adj.* [Colloq.], (١) لاتەخت؛ ڕووتەخت.
(٢) درێژو باریك؛ ڕیبوەڵە؛ باریکەڵە؛ ڕەقەڵە.
**slack** (slak), *adj.* (١) سست؛ خاو؛ خاوخلیچك؛ هێواش؛ تەمەڵ؛ شلەپەتە. (٢) مەنگ؛ وەستاو (ئاو، تەوژمی ئاو و کارەبا)؛ هێواش.
(٣) بێ بازاڕ؛ خاو (بازرگانی)؛ کز: *( a ~ period in car sales)*
(٤) شل؛ شلوشۆڕ؛ نەجەڕێنراو؛ توند نەکراو: *( a ~ rope)* .
(٥) شل؛ بە ئاسانی کارتێکراو.
(٦) کەمتەرخەم؛ فەرامۆش کار؛ بێباك؛ لامسەرلا؛ بێ گوێ پانە کراو: *( a ~ workman; ~ book-keeping)*
*v.t.* (١) شل کردن؛ خاوکردنەوە؛ شل کردنەوە (گوریس، گرێ، ژێ).
(٢) فەرامۆش کردن؛ کەمتەرخەمی کردن؛ گوێ پێ نەدان؛ لامسەرلایی کردن.

(٣) قسڵ کوژاندنەوە یا مراندن
*v.i.* خاوبوونەوە؛ سست بوون؛ هێواش بوونەوە.
*adv.* بە شل‌وشۆڕی؛ بە شلی؛ بە دواکەوتوویی.
*n.* (١) بەشێکی شل یا نەجەڕێنراو؛ بەشێکی خاو یا شۆڕبووەوە:
*( to pull in the ~ of a rope )*
(٢) شلی، نەجەڕێنراوی؛ شل‌وشۆڕی: *( There was ~ in the rope.)* .
(٣) وەستان (ئاو، تەووژم)؛ مەنگی.
(٤) بێ بازاڕی؛ بازاڕ کزی؛ کزی؛ سست.
(٥) بڕگەی هێز نەخراوە سەر (هەڵبەست).
-slackly *(adv.)*; slackness *(n.)*.
**slack off,** خاوبوونەوە؛ سست بوون؛ ساردبوونەوە؛ فەرامۆش کردن:
شل کردنەوە؛ شل بوون.
**slack up,** هێواش کردنەوە؛ خاوکردنەوە (شەمەندەفەر).
**slack** (slak), *n.* خاک‌وخۆڵی خەڵووز.
**slack** (slak), *n.* (١) (ا) دۆڵێکی بچووک
(ب) چاڵایی ئاوزەمین یا قەدگرد (٢) زۆنگاو؛ زەلکاو.
**slack-baked** (slak′bāk´t), *adj.* (١) نەبرژاو (نان).
(٢) نەبەکام، کاڵ‌و کرچ؛ کاڵ (مەجاز).
**slacken** (slak′ən), *v.i.* (١) سست بوون؛ هێواش بوونەوە؛
خاوبوونەوە؛ پشت ساردبوونەوە؛ ساردبوونەوە.
(٢) کزبوون (بازرگانی، فرۆشت)؛ ساردبوونەوە
(٣) شل بوونەوە (گوریس، پەت)؛ شل بوون؛ خاوبوونەوە.
*v.t.* (١) هێواش کردنەوە؛ کەمکردنەوە (توندوتیژی، خێرایی)؛
شل کردن (جڵەو، زەبرووزەنگ). (٢) شل کردن (پەت، گری)؛ شل کردنەوە.
**slacker** (slak′ĕr), *n.* ڕاکردوو لە ئەرکی سەرشان (بەتایبەتی لە
سەربازی لەکاتی جەنگدا).
**slacks** (slaks), *n.pl.* پانتۆڵ (ژنانەو پیاوانە).
**slack water,** (١) ماوەی نێوان بەرزاو و نیشتاو (کە ئاوی کەناردەریا
هێمن دەبێتەوە). (٢) ئاوی مەنگ یا وەستاو.
**slag** (slag), *n.* (١) تڵپەو سەرکەف‌و خڵتەی کانزا (کە لە تواندنەوەو
پوختەکردنی کانزای خاو دەمێنێتەوە). (٢) خڵتەو کەفی ئاگرپژێن.
*v.t. & v.i.* بوون بەتڵپەو سەرکەف
-slaggy *(adj.)*.
**slain** (slān), *past participle of* **slay**.
**slake** (slāk), *v.t.* (١) تینوێتی شکاندن؛ تێرکردن؛
دامرکاندنەوە (ئارەزوو) (٢) کوژاندنەوە (ئاگر)؛ کپکردن؛ دامرکاندنەوە.
(٣) قسڵ کوژاندنەوە یا مراندن (٤) ئاودان؛ تەڕکردن؛ فێنك کردنەوە.
(٥) هێمن کردنەوە؛ کەمکردنەوە؛ هێواش کردنەوە
*v.i.* (١) (ا) کوژانەوە (قسڵ)؛ مران‌و پروان (قسڵ). (ب) شکان (تینوێتی).
(٢) خاوبوونەوە؛ هێواش بوونەوە؛ هێمن بوونەوە
**slalom** (slä′lōm), *n.* (١) بەفرەخلیسکێ بە ڕێبازێکی پێچ پێچۆکەی
لێژدا. (٢) پێش برکێی بەفرەخلیسکێی وەها.
(٣) ڕێبازی پێچاوپێچ یا پێچ پێچۆکە.
*v.i.* بەفرەخلیسکێ کردن بە ڕێبازێکی پێچ پێچۆکەدا.
**slam** (slam), *v.t.* (١) بە قایم داخستن (دەرگا)؛
شەقە لێ هەڵساندن لەکاتی داخستندا: *( Don't ~ the door.)*
(٢) تێ فڕێدان؛ خستنە ناو بە قایم‌و بە دەنگی بەرز؛ بە توند دانان:
*( He ~med the box into the cupboard.)*
(٣) بەیەکدادان؛ پیاکێشان؛ بەتوند پیادان.
(٤) [Colloq.]، بەتوندوتیژی ڕەخنەلێگرتن؛ بە دەم هێرش بردنە سەر.
*v.i.* (١) بە قایم داخران؛ شەقە لێ هەڵسان لەکاتی داخستندا.
(٢) بە توند لێدان یا پیادان.
*n.* (١) بە توندو دەنگی بەرز داخستن؛ داخران بە شەقە لێ هەڵسانەوە.
(٢) شەقە؛ تەقەی گەورە؛ دەنگی زل (کە لەم داخستنەوە بێت).
(٣)[Colloq.]، ڕەخنەی توندوتیژ؛ هێرش

**slam** (slam), *n.* هەموو بردنەوە (یاری کاغەز)؛ بردنەوەی تەواو.
**slam-bang** (slam′baŋ´), *adv.* [Colloq.], (١) خێراو بە دەنگی
بەرز؛ لە پڕو بە دەنگی بەرز؛ بە توند. (٢) بە هەڵەشەیی؛ سەرکێشانە؛
سەرپێچانە.
**slander** (slan′dēr), *n.* (١) بوختان.
(٢) بەدگۆیی؛ ناوزڕاندن؛ ناو پیس کردن؛ قسە شوێن خستن.
*v.t.* بوختان بۆ هەڵبەستن؛ لەکەدارکردن؛ ناوزڕاندن؛ ناو پیس کردن؛
بەدگۆیی کردن.
-slanderer *(n.)*.
**slanderous** (slan′dēr-əs), *adj.* (١) بوختان؛ هی ناو زڕاندن یا
لەکەدارکردن: *( a ~ statement)* .
(٢) بوختانکەر؛ ناوپیسکەر؛ ناوخراپکەر؛ بەدگۆ؛ لەکەدارکەر.
**slang** (slaŋ), *n.* (١) زمانی تاوانکاران‌و دەربەدەران.
(٢) زمانی پیشەیەکی تایبەتی (ئێستا پێی دەوترێ " **jargon** " یا
" **shoptalk** "). (٣) زمانی ناوبازاڕ؛ زمانی سەرجادە، واتە هی گفتوگۆ نەك
نووسین.
*v.i. & v.t.* زمانی ناوبازاڕ بەکارهێنان؛ قسەی ناشرین پێ ووتن.
-slangily *(adv.)*; slanginess *(n.)*.
**slangy** (slaŋ′i), *adj.* (١) لە زمانی ناوبازاڕ دەچێ نەك هی نووسین؛
پڕە لە زمانی سەرجادە. (٢) حەز لە بەکارهێنانی زمانی ناوبازاڕ دەکات؛
زۆر زمانی سەر جادە بەکاردەهێنێ.
**slant** (slant), *v.t.* (١) خوارکردنەوە؛ لارکردنەوە؛ چەوت کردن.
(٢)[Colloq.]، بە لایەکدا خستن (دەنگوباس، ڕاستی)؛ شێواندن؛ گۆڕین؛
تێکدان: *( to ~ the news, the truth, etc.)* .
*v.i.* خواربوونەوە؛ لاربوون؛ نارێك بوون؛ بەلاداکەوتن.
*n.* (١) لاری؛ خواری؛ چەوتی؛ لێژی؛ بەرەوخوار.
(٢) [Colloq.]، لایەنگری؛ ڕای تایبەتی؛ هەڵوێست:
*( to give the news a ~ )*
(٣) [Colloq.]، سەیرکردنێکی کورت‌و پەلە؛ تەماشایەکی گورج
*adj.* لار؛ خوار؛ نارێك؛ بەرەو خوار.
**slantways** (slant′wāz´), *adv.* = **slantwise.**
**slantwise** (slant′wīz´), *adv.* بە خواری؛ بە لاری؛ بە چەوتی؛
بە نارێکی.
*adj.* خوار؛ لار؛ نارێك؛ چەوت.
**slap** (slap), *n.* (١) زللە؛ شەقازلە؛ شەپازلە؛ شەپلاخ.
(٢) ڕووشکاندن (بە قسە یا کردەوە)؛ شکاندن؛ ڕیسواکردن:
*( a ~ in the face.)*
*v.t.* (١) زللەلێدان؛ شەپازلە لێدان؛ شەپلاخ پیامالین.
(٢) بە لامسەرلایی یا بە توند تێ کردن؛ پێوەدان (وەك نان بە تەنوورەوە).
*( She ~ped the butter into the pan.)*
*adv.* [Colloq.], (١) لەپڕ؛ لە ناکاو.
(٢) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ: *( He ran ~ into the wall.)* .
-slapper *(n.)*.
**slap down,** (١) قەدەغەکردن؛ ڕێ لێ بڕین؛ ڕێ پێ نەدان.
(٢) دامرکاندنەوە؛ کوژاندنەوە؛ نەهێشتن؛ پێشێل کردن.
**slap-bang** (slap′baŋ´), *adj. & adv.* [Colloq.], = **slap-dash.**
**slap-dash** (slap′dash´), *n.* (١) لامسەرلایی؛ پەلە؛ کوتوپڕی؛
هەڵەشەیی. (٢) شتێکی بە هەڵەشەو لامسەرلایی کراو؛ شتی بێ سەروبن:
*( His book is mere ~ .)*
*adv.* بەلامسەرلایی‌و بەپەلە؛ بێ دەربەستانە؛ بە هەڵەشانە؛ بێ سەروبنانە.
*adj.* لامسەرلاو پەلە؛ هەڵەشە؛ بێ دەربەست؛ بێ سەروبن.
**slap-happy** (slap′hap´i), *adj.* [Slang], (١) گێژی مستەکوڵە؛
وڕ (هەروەك بە مستەکوڵە وای لێ هاتبێ). (٢) شەل‌وپەت؛ بێ مێشك؛
سەرمەست.
**slap-jack** (slap′jak´), *n.* یارییەکی کاغەزی ئاسانە.

**slap-stick** (slap′stik´), *n.* (١) دوو دارن سەرێکیان پێکەوە بەستراوە کە بە شتێکدا دران شەقەیان لێ هەڵدەستێ (لە کۆندا ئەکتەر بەکاریان دەهێنا بۆ تەقە لێ هەلسانی پیاماڵینێك). (٢) شانۆنامەی شەقەوتەقە: شانۆنامەیەکی قۆشمەیە پڕە لە زرمەزلاو کردەوەی هیچ‌وپووچ‌و منداڵانە.

*adj.* تایبەتی بەم جۆرە شانۆنامەیە.

**slash** (slash), *v.t.* (١) هەڵدرین بە توندو بە گوڕ لێ گرتنەوە بە چەقۆ یا تیغی تر؛ هەڵقڵیشاندن بەم جۆرە؛ دراندن. (٢) برین؛ هەڵدرین:

*( He fell on the broken glass and ~ed his arm.)*

(٣) قامچی لێدان؛ قەلاقەکردن؛ بیرازکردن.

(٤) داقڵیشان یا تڵیشانی جل‌وبەرگ بۆ جوانی (بۆ دەرخستنی شتی ژێرەوە).

(٥) زۆر کەمکردنەوە (بووجە، مووچە، نرخ)؛ زۆر داشکاندن:

*( Our budget has been ~ed.; We have ~ed our prices.)*

(٦) بە توندی رەخنەلێگرتن.

*v.i.* بە توند پیاماڵین بە چەقۆ یا شتێکی تیژی تر.

*n.* (١) بە توند لێدان بە چەقۆ یا شتێکی تری تیژ.

(٢) تڵیش (بەم لێدانە)؛ قڵیش؛ هەڵدران.

(٣) تڵیشی جل‌وبەرگ (کە بە دەستقەست بۆ جوانی تێی دەکرێ)؛ داقڵیشاوی.

(٤) (ا) شوێنێکی کراوەیە لە دارستانێکدا چڵ‌وچێوی داری بڕراوەی تێدا کۆمەڵ دەکرێ. (ب) ئەم چڵ‌وچێوو لق‌و پۆپە.

**slash** (slash), *n.* زۆنگاوی نزم؛ زەلکاو.

**slashing** (slash′iŋ), *adj.* (١) توندوتیژ؛ توند؛ بەزەبر.

(٢) چوست‌و چالاك؛ بە گڤ‌وگوڕ؛ بەتین.

(٣) [Colloq.]، گەورە؛ زل؛ زۆر گەورە؛ زۆر: *( a ~ success )* .

*n.* تڵیش؛ قڵیش؛ هەڵتڵیشان.

**slash pine,** (١) کاجی زەلکاو؛ دارسنەوبەری زۆنگاو.

(٢) داروتەختەی ئەم کاجە.

**slat** (slat), *n.* (١) تیرەدار یا کانزایەکی باریك‌و تەنك‌و درێژ.

(٢) [Slang] (*pl* ) پەراسوو.

*v.t.* بە تیرەدار یا کانزای باریك‌و تەنك‌و درێژ درووستکردن؛ ئەم جۆرە تیرەدارە لێدان.

**slat** (slat), *v.i.* شەکانەوە (وەك جلی سەر تەناف)؛ راوەشان.

*v.t.* [Dial.], (١) بە توند هاویشتن یا فڕێدان. (٢) لێدان؛ پیاماڵین؛ پیادان.

*n.* [Dial.], پیاماڵین؛ پیادانێکی قایم.

**slate** (slāt), *n.* (١) تەختە بەردێکە بە ئاسانی توێژاڵی لێ دەکرێتەوە.

(٢) (ا) توێژاڵێکی وەها لێکراوە (بەتایبەتی بۆ سەربان گرتن‌و شت لەسەر نووسین). (ب) توێژاڵە بەردی نووسین (بۆ منداڵان).

(٣) رەنگی بۆری شینکار (کە رەنگی ئەم تەختەبەردانەیە).

(٤) لیستەی نامزەدکراوان (بۆ هەڵبژاردن)؛ لیستەی هەڵبژێرراوان:

*( a ~ of candidates)*

(٥) رابوردووی کەسێك؛ تۆماری رەفتاری رابوردوو:

*( She has a clean ~ .)*

*v.t.* (١) بە تەختەبەردی تەنك داپۆشین (سەربان).

(٢) نامزەدکردن (بۆ هەڵبژاردن، دانان لەسەر کار، نوواندن لە شانۆنامەو فیلمدا)؛ هەڵبژاردن

*( He is ~d for the position of director of communications.)*

**a clean slate,** رابوردووی پاك:

*( He has a clean slate.)*

**start with a clean slate,** پەڕەی تازە هەڵدانەوە (مەجاز). سەرلەنوێ بە پاکی دەستپێکردنەوە

**slate** (slāt), *v.t.* [Colloq.], (١) بە قایمی لێدان بە توندوتیژی سزادان؛ خراپ لێدان. (٢) زۆر سەرزەنشت کردن؛ بە توندوتیژی رەخنەلێگرتن.

**slater** (slāt′ĕr), *n.* (١) سەربانگر بە تەختەبەردی تەنك.

(٢) wood louse.

**slather** (slath′ĕr), *n.* [Dial. or Colloq.], بڕێکی زۆر.

بڕێکی زۆر.

*v.t.* [Dial or Colloq.], هەندێکی زۆر بەکارهێنان؛ زۆر بەکارهێنان.

**slating** (slāt′iŋ), *n.* (١) سەربان گرتن بە تەختەبەردی تەنك؛ تەختەبەردی تەنك لەسەر دانان. (٢) تەختەبەردی تەنك بەگشتی (خانووسازی).

**slattern** (slat′ĕrn), *n.* (١) ئافرەتی چەپەڵ؛ ژنی پیس‌و پۆخڵ.

(٢) قەحبە؛ ئافرەتی سووك.

**slatternly** (slat′ĕrn-li), *adj.* (١) چەپەڵ؛ پیس‌و پۆخڵ؛ چەپەڵانە.

(٢) قەحبانە؛ وەك قەحبە.

-**slatternliness** *(n.)*; **slatternly** *(adj.)*.

**slaty** (slāt′i), *adj.* (١) تەختەبەردی؛ توێژاڵە بەردی.

(٢) بۆری شینکار (وەك رەنگی تەختەبەرد).

**slaughter** (slô′tĕr), *n.* (١) سەربڕین (مەڕومالات).

(٢) کوشتن بە دڕندانە. (٣) کوشتار؛ قەلاچۆ؛ کوشت‌و کوشتار؛ کوشتنی خەڵکێکی زۆر بە دڕندانە؛ خوێن ڕشتن.

*v.t.* (١) سەربڕین (ئاژەڵ).

(٢) قەلاچۆکردن؛ کوشتنی خەڵکێکی زۆر بە دڕندانە؛ خوێن ڕشتن.

**slaughter-house** (slô′tĕr-hous´), *n.* کوشتارخانە؛ قەسابخانە.

**slaughterous** (slô′tĕr-əs), *adj.* خوێنڕێژ؛ بکوژ.

**slave** (slāv), *n.* (١) کۆیلە؛ بەندە؛ قول.

(٢) گیرۆدە؛ گرفتار: *( a ~ to alcohol)* .

(٣) کەسێکی زۆر کۆششکەر؛ زۆر رەنجدەر؛ کەسێکی زۆر ئیشکەر.

(٤) slave ant

*v.i.* زۆر رەنج دان؛ خۆکوشتن (مەجاز)؛ زۆر ئیش کردن.

*v.t.* [Rare]. کردن بە کۆیلەی خۆ؛ خستنە ژێر دەستی خۆوە.

**slave ant,** مێرووڵەی کۆیلە: مێرووڵەیەکە توخمە مێرووڵەی تر گرتبێتیان‌و ئیشی پێ بکەن وەك بەندە.

**slave driver,** (١) سەرکاری کۆیلەکان.

(٢) سەرکاری بێ بەزەیی؛ سەرکارێکە کە زۆر ئیش بە بەردەستەکانی بکات.

**slave-holder** (slāv′hōl´dĕr), *n.* خاوەن کۆیلە؛ بەندەدار.

**slave-holding** (slāv′hōl´diŋ), *adj.* هی خاوەن کۆیلە.

*n.* کۆیلەداری؛ بەندەداری؛ خاوەن کۆیلەیی.

**slave-making ant,** جۆرە مێرووڵەیەکە دەدەن بەسەر شارە مێرووڵەی توخمی تردا و کرمۆکەیان دەدزن‌و پەروەردەیان دەکەن‌و دەیان کەن بە کۆیلەی خۆیان (هەروەها " slave maker ").

**slaver** (slāv′ĕr), *v.i.* (١) لیك لە دەم هاتن؛ ئاو لە دەم هاتن.

(٢) قسەی هیچ‌و پووچ‌و بێ تام کردن.

*v.t.* لیك بەسەردا رژان.

*n.* (١) لیك؛ ئاوی دەم. (٢) قسەی هیچ‌وپووچ‌و بێ تام؛ قسەی قۆڕ.

**slaver** (slāv′ĕr), *n.* (١) کەشتی کۆیلە.

(٢) کۆیلەفرۆش؛ بازرگانی بەندە.

**slavery** (slāv′ĕr-i), *n.* (١) کۆیلەیی؛ بەندایەتی؛ بەندەگی؛ بەندەیی؛ نۆکەرێتی؛ بەندێتی. (٢) گیرۆدەیی؛ گرفتاری.

(٣) رەنج؛ کۆشش؛ رەنجی زۆر؛ رەنج کێشان

**slave ship,** کەشتی کۆیلە (کە لە کۆیلە فرۆشیدا بەکاردەهێنرا).

**Slave State,** یەکێکە لەو پانزە وولاتەی وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (کە زۆربەیان لای خوارووەوەن) کە کۆیلە فرۆشیان تیابوو لە پێش شەڕی برنکرتن ئەمەریکاوە.

**slave trade,** کۆیلەفرۆشی (بەتایبەتی هێنانی ڕەشپێستی ئەفەریقا بۆ ئەمەریکا و فرۆشتنیان)؛ بەندە کڕین‌و فرۆشتن؛ بەندە بازرگانی.

**slavey** (slāv′i), *n.* [British Colloq.], کارەکەر

**Slavic** (slav′ik, släv′ik), *adj.* سلاڤی؛ تایبەتی بە سلاڤییەکان‌و زمانەکانیان

*n.* زمانی سلاڤی (کە بەشێکە لە زمانە هیندی ئەوروپییەکان).

**slavish** (slāv′ish), *adj.* (١) ... ؛ پیس؛ چارەڕەش؛

نۆکەرئاسا. (۲) بۆ بەندە شیاو؛ بەندەیی؛ زۆردار؛ ستەمکار؛ چەوسێنەرەوە.
(۳) لاساییکەرەوە؛ کوێرانە شوێن کەوتوو:
*( a ~ adherence to a model)*
(٤) قورس و ناخۆش (کار).
**-slavishly** *(adv.)*; **slavishness** *(n.)*.
**slavocracy** (slāv-ok′rə-si), *n.* بەندەدارو بەندەیی خوازان (لە ئەمەریکادا لە پێش شەڕی ناوخۆدا).
**Slavonian** (slə-vō′ni-ən), *adj.* (۱) سلاڤۆنی؛ تایبەتی بە سلاڤۆنیاو دانیشتووەکانی. (۲) سلاڤی.
*n.* (۱) سلاڤۆنی؛ هاوولاتیی‌یەکی سلاڤۆنیا. (۲) سلاڤی (مرۆڤ).
(۳) زمانە سلاڤی‌یەکان.
**Slavonic** (slə-von′ik), *adj.* (۱) سلاڤۆنی. (۲) سلاڤی.
*n.* زمانە سلاڤی‌یەکان.
**slaw** (slô), *n.* زەلاتەی کەلەرم (بە وورد جنراوی).
**slay** (slā), *v.t.* (۱) کوشتن؛ سەربڕین.
(۲) [Obs.]، لێدان.
**sleave** (slēv), *n.* (۱) (ا) تالە ئاوریشمی خاوی جیابووەوە.
(ب) ئالۆسکاوی؛ ئالۆسکان.
*v.t.* ڕەواندنەوە؛ خاوکردنەوە.
**sleazy** (slē′zi, slā′zi), *adj.* (۱) تەنک و بەرگە نەگر (کالا)؛ سووک (قوماش)؛ بێ کەلک: *( a ~ fabric)* .
(۲) بازاڕی؛ هەرزانبەها؛ گەند.
(۳) هیچ‌وپووچ: *( a ~ excuse)* .
(٤) سووک (ڕەووشت)؛ نزم (مرۆڤ، ڕەفتار):
*( a ~ character, behavior, etc.)*
**-sleazily** *(adv.)*; **sleaziness** *(n.)*.
**sled** (sled), *n.* (۱) گالیسکە بەفرینە (بە ئەسپ یا سەگ ڕادەکێشرێت).
(۲) ئەسپە بەفرینە (چوارچێوەیەکە بۆ یاری منداڵان).
*v.t.* بە گالیسکە بەفرینە گواستنەوە.
*v.i.* سواری گالیسکە بەفرینە بوون.
**-sledder** *(n.)*.
**sledding** (sled′iŋ), *n.* (۱) بە گالیسکە بەفرینە ڕۆیشتن؛ سواری گالیسکە بەفرینە بوون. (۲) باری سواربوونی گالیسکە بەفرینە (لەڕووی ئاووهەواو بەفرەوە) (۳) [Colloq.]، دۆخ، بار، قورسی و ئاسانی کار:
*( The ~ gets tougher every year in this business.)*
**sledge** (slej), *n.* پێک؛ چەکوشی قورس.
(هەروەها " sledge-hammer ").
*v.i. & v.t.* پێک پیادان؛ پێککاری کردن.
**sledge** (slej), *n., v.i. & v.t.* = **sled.**
**sledge-hammer** (slej′ham´ēr), *n.* پێک؛ چەکوشێکی قورسی کلک درێژە بە هەردوو دەست بەکار دەهێنرێ بەردو چیمەنتۆی پێ دەشکێنرێ (هەروەها " sledge ").
*v.t.* پێک لێدان؛ چەکوشی قورس پیادان؛ بە توند لێدان.
*adj.* بەزەبر؛ توندوتیژ؛ بە زەبروزەنگ؛ توند:
*( ~ blows, arguments, style, etc.)*
**sleek** (slēk), *adj.* (۱) سافونووس؛ بریقەدار؛ شەوقدار؛ بریقاوە (قژ، پێست) *( ~ dark hair)*
(۲) پۆشتەوپەرداخ؛ تەڕپۆش؛ لەش‌ولار جوان؛ تێروتەسەل.
(۳) کەشێ بە کەمتەکردنەیە. (٤) ڕێک‌وپێک؛ جوان بە [illegible]؛ شۆخ؛ قۆز.
(٥) زمان لووس؛ زمانلووس؛ لووس؛ فێڵباز (هەروەها " slick ").
*v.t.* سافونووس کردن؛ تیف تیفەدان؛ بریق خستن؛ بریقە [illegible].
**-sleekly** *(adv.)*; **sleekness** *(n.)*.
**sleep** (slēp), *n.* (۱) نوستن؛ خەوتن؛ خەولێکەوتن.
(۲) ماوەی نوستن یا خەوتن.
(۳) [illegible] سڕبوون؛ سڕبوونی زستانە [illegible].



(ب) سڕبوون؛ مێروولەکردن: *( My leg has gone to ~ .)* .
(ج) لە هۆش خۆ چوون؛ بوورانەوە.
(د) مردن: *( to put a pet dog to ~ )* .
(٤) داخستنی پەڕەی هەندێ گوڵ لە شەودا.
*v.i.* (۱) نوستن؛ خەوتن؛ خەولێکەوتن.
(۲) سڕبوون؛ سڕبوون بۆ زستان (مار)؛ بوورانەوە؛ مردن؛ لە هۆش خۆ چوون.
(۳) داخران بە شەو (پەڕەی هەندێ گوڵ، گەڵا).
*v.t.* (۱) نووستن بە جۆرێکی تایبەتی؛ خەولێکەوتن؛ خەوتن:
*( He slept the ~ of the just.)*
(۲) جێی نووستن تێدابوونەوە: *( This cabin will ~ four.)*
(۳) لەبیرخۆبردنەوە بە نووستن: *( He went home to ~ it off.)* .
**go to sleep,** (۱) نوستن؛ خەولێکەوتن. (۲) سڕبوون؛ مێروولەکردن.
**put to sleep,** (۱) کردنە خەو.
(۲) سڕکردن (بە دەرمان)؛ بەنج کردن (بۆ نەشتەرکاری).
(۳) کوشتن (بە دەرمان بەتایبەتی گیانداری پیرو نەخۆش و نەویستراو):
*( She put her old cat to sleep.)*
**sleep around,** [Colloq.], چوونە جێ لەگەڵ هەموو کەسێکدا؛ جووت بوون لەگەڵ هەمووکەس؛ بەرەڵابوون.
**sleep away,** (۱) بە نووستن بردنە سەر:
*( He slept away his vacation.)*
(۲) لە بیری خۆ بردنەوە یا خۆ لێ ڕزگارکردن بە نووستن.
**sleep in,** (۱) لە شوێنی ئیش کردندا نووستن (بەردەستی ناوماڵ، کارەکەر). (۲) درەنگ لە خەو هەڵسان (بە دەستنقەست)؛ هەتا درەنگ نووستن:
*( I sleep in on week-ends.)*
**sleep off,** لەبیرخۆبردنەوە یا خۆ لێ ڕزگارکردن بە نووستن:
*( He was drunk so he went to bed to sleep it off.)*
**sleep on (or over) a question,** بڕیار نەدان تا ڕۆژی دوایی؛ بڕیار دواخستن تا ڕۆژی دوایی؛ لەسەر نووستن.
**sleep with,** چوونە جێ لەگەڵ؛ جووت بوون لەگەڵ؛ چوونە لا.
**sleeper** (slēp′ēr), *n.* (۱) کەسێک یا گیاندارێکی نووستوو یا خەوتوو (بە تایبەتی بە جۆرێکی تایبەتی): [ *She is a light (heavy) ~* ].
(۲) [British]، داری ئەستووری لەسەر زەمین ڕاخراو (وەک ئەرگەی ژێر هێڵی شەمەندەفەر). (۳) فارگۆنی نووستن لە شەمەندەفەردا. (٤) جۆرێکە لە ماسی.
(٥) کەسێک یا شتێکە کە لە پڕ دەرووی لێ دەکرێتەوەو سەر دەکەوێ و برەو دەسەنێ (ئەسپی غارغارێن، پەرتووک، فرۆشتنی...هتد).
**sleepiness** (slēp′i-nis), *n.* خەوالوویی؛ خەومنووچکێ؛ خەوهاتن؛ وەنەوزەکوتن.
**sleeping bag,** توورەکەی خەو (وەک لێفەیەکە کە قەراغەکەی زیزەی پێوەیە بۆ تێدا نوستن بە تایبەتی لە دەرەوەی ماڵ).
**sleeping car,** فارگۆنی نووستن لە شەمەندەفەردا.
**sleeping partner,** [British], = **silent partner.**
**sleeping pill,** حەبی نووستن؛ حەبی نوێنەر؛ حەبی خەو.
**sleepint sickness,** نەخۆشی نووستوویی؛ خەوە نەخۆشی: ـرمێکە تووشی خەڵکی ناوچە گەرمەکانی ئەفەریقا دەبێ نیشانەکانی تاو لاوازی و لەرزین و خەوالووتی‌یە هەندێ جاریش کوشندەیە.
**sleepless** (slēp′lis), *adj.* (۱) بێ خەو؛ خەو زڕاو؛ بێ ئارام؛ خەو لێ نەکەوتوو
(۲) هەمیشە بە جم‌وجوول؛ هەرگیز نەوەستاو: *( the ~ wind)* .
(۳) هەمیشە وریا؛ هەمیشە بەئاگا یا هوشیار.
**-sleeplessly** *(adv.)*; **sleeplessness** *(n.)*.
**sleep-walker** (slēp′wôk´ēr), *n.* خەوگەڕ؛ کەسێکە کە لە کاتی نووستندا دەگەڕێ.
**-sleep-walk** *(v.i.)*.
**sleep-walking** (slēp′wôk´iŋ), *n.* خەوگەڕی؛ گەڕان لە کاتی نووستندا؛ ڕۆیشتن بە [illegible]

**sleepy** (slēp′i), ***adj.*** (١) خەوالوو؛ خەوی دێت.
(٢) نوستوو؛ مردوو (مەجاز)؛ خامۆش؛ بێ دەنگ: ***( a ~ little town)*** .
(٣) خەولێخەر؛ نوێنەر.
**-sleepily** ***(adv.).***
**sleepy-head** (slēp′i-hed′), ***n.*** کەسێکی خەوالوو.
**sleet** (slēt), ***n.*** (١) تەرزەلووکە؛ تەرزە. (٢) زوقم.
***v.i.*** تەرزەلووکە بارین
**-sleety** ***(adj.).***
**sleeve** (slēv), ***n.*** (١) سەرقۆل؛ سەردەست؛ قۆل (کراس، چاکەت).
(٢) کەفێکی لوولەکێیە سەری بۆرییەکی تێ دەخرێ؛ ئەلقەیەکە سەری بۆرییەکی تێ دەخرێ.
***v.t.*** (١) سەرقۆل بۆ کردن؛ سەردەست بۆ کردن.
(٢) سەری بۆری کردن بە ئەلقە یا کیفی لوولەکیدا.
**laugh up one's sleeve,** لەبەر خۆوە پێکەنین؛ بە سەیر هاتنەبەرچاو.
**up one's sleeve,** فێڵ لە ژێر سەردا هەبوون؛ فێڵ بەدەستەوە بوون:
***( He must have some trick up his sleeve.)***
**wear one's heart on one's sleeve,** هەستی خۆ بە ئاشکرا دەربڕین (بەتایبەتی هی دڵداری یا خۆشەویستی)؛ هیچ نەشاردنەوە؛ لەرووبوون.
**sleeved** (slēvd), ***adj.*** قۆلدار: ***( short- ~ )*** .
**sleeveless** (slēv′lis), ***adj.*** بێ قۆل (بەرگ): ***( a ~ sweater)*** .
**sleigh** (slā), ***n.*** گالیسکە بەفرینە (بۆ خەڵک و بار گواستنەوە بەسەر بەفردا).
***v.i.*** سواری گالیسکە بەفرینە بوون؛ گالیسکە بەفرینە لێخوڕین.
**sleigh bells,** زەنگی ئەسپی گالیسکە بەفرینە.
**sleight** (slīt), ***n.*** (١) فێڵبازی؛ فێڵ و تەڵەکە؛ تەڵەکەبازی؛ زۆرزانی.
(٢) فێڵ؛ تەڵەکەبازی. (٣) کارامەیی؛ شارەزایی؛ ووریایی؛ کارسازی.
**sleight of hand,** (١) دەست سووکی جادووگەر؛ فێڵبازی و ووریایی و زۆرزانی جادووباز. (٢) فێڵێك لە فێڵەکانی جادووگەر؛ فێڵی بێ نەزانراو.
**slender** (slen′dẽr), ***adj.*** (١) باریکەڵە؛ قەد باریك؛ باریك؛
لەر؛ سووکەڵە: ***( She has a ~ body.)*** .
(٢) کەم؛ کز: ***( ~ wages, earning, etc.)*** .
(٣) کەم؛ بێ بنچینە؛ کز: ***( ~ hope; only a ~ chance for success)*** .
**slenderize** (slen′dẽr-īz′), ***v.t. & v.i.*** لەرکردن؛ لەربوون؛ قەد باریك کردن.
**slept** (slept), *past tense and past participle of* sleep.
**sleuth** (slōōth), ***n.*** (١) sleuth-hound.
(٢) [Colloq.]: detective.
***v.i.*** پۆلیسێتی نهێنی کردن.
**sleuth-hound** (slōōth′hound′), ***n.*** (١) جۆرە سەگێکی بۆن تیژە بۆ شوێن پێ هەڵگرتن و دۆزینەوەی تاوانکار؛ سەگی چمش.
(٢) [Colloq.]: detective.
**slew** (slōō), ***n.*** = slough.
**slew** (slōō), ***n., v.t. & v.i.*** = slue.
**slew** (slōō), ***n.*** [Colloq.], زۆر؛ ژمارەیەکی زۆر؛ برێکی زۆر.
(هەروەها " slue ").
**slew** (slōō), *past tense of* slay.
**slice** (slīs), ***n.*** (١) قاش؛ کووز؛ برگە؛ توێ؛ توێژاڵ؛ پارچە:
***( a ~ of apple)***
(٢) بەش؛ بڕ: ***( He spent a large ~ of his winnings.)*** .
(٣) چەقۆیەکی دەم پان و تەنك و نەرمە
(٤) شیشێکی دەم پانە بۆ مەرەکەب بڵاوکردنەوە (چاپکاری).
(٥) تۆپ لێدانێکە کە بەلای راستدا بچێ یا بەلای چەپدا (یاری گۆلف).
***v.t.*** (١) قاش کردن؛ جنین؛ توێ توێ کردن.
(٢) ( ~ off; ~ from; ~ away ) قاش لێکردنەوە؛ لێکردنەوە.
(٣) هەڵدڕین (هەر وەك بە چەقۆ): ***( The plow ~d the land.)***
(٤) بەش کردن؛ دابەش کردن؛ بەش بەش کردن.
(٥) مەرەکەبی چاپکاری بڵاوکردنەوە یا رووبەك کراندن و پاك کردنەوە بە شیشێکی دەم پان. (٦) لێدانی تۆپی گۆلف بەجۆرێك کە بەلای راستدا بڕوات (بۆ راستەڵەر) یا بەلای چەپدا (بۆ چەپلەر).
***v.i.*** تۆپی گۆلف لێدان بەجۆرێك کە بەلای راستدا بچێ یا بەلای چەپدا.
**slice bar,** شیشە ئاسنێکی دەم پانە (بۆ ئاگردان پاکردنەوە).
**slicer** (slīs′ẽr), ***n.*** (١) قاشکەر (مرۆڤ).
(٢) ئامێرێکی قاش کردن یا توێ توێ کردن.
**slick** (slik), ***v.t.*** (١) ساف و لووس کردن؛ بریقە لێ هەڵسان
(٢) [Colloq.]: ( ~ up ) جوان و رێك و پێك کردن؛ تەپۆش کردن؛ شۆخ کردن
***adj.*** (١) ساف و لووس؛ بریقەدار؛ شەوقدار؛ بریقاوە.
(٢) خلیسك؛ خز: ***( a ~ road)*** .
(٣) بە توانا؛ لێهاتوو؛ زیرەك؛ زرنگ؛ زانا؛ دانا.
(٤) [Colloq.]: فروفێڵاوی؛ فێڵاوی؛ زۆرزانانە.
(٥) زمان لووس؛ زۆرزان: ***( a ~ businessman)*** .
(٦) [Colloq.]، بە رووکەش جوان و باش:
***( a ~ book, magazine, etc.)***
(٧) [Slang]، نایاب، باش، خۆش.
***n.*** (١) رووبەکی خز؛ شوێنێکی خلیسك؛ پەڵەیەك رۆنی سەر رووی ئاو یا رێگە کە خزی دەکات (٢) رەندە؛ ئەسکەنە.
(٣) [Slang]، گۆڤارێکی لەسەر کاغەزی چاك و ساف و لووس چاپکراو و کەم بایەخی وێژەییە.
***adv.*** زیرەکانە؛ بە زۆرزانانە؛ بە لێهاتووانە؛ بە جوان و رێك و پێکی
**slicken-side** (slik′n-sīd′), ***n.*** رووبەکی ساف و لووسی بەرد (کە بە لێخستنی سرووشتی وای لێ هاتبێ).
**slicker** (slik′ẽr), ***n.*** (١) پاڵتۆی باران.
(٢) [Colloq.]، کەسێکی قومارباز و ساختەچی.
**slid** (slid), *past tense and past participle of* slide.
**slidden** (slid′′n), *alternative past participle of* slide.
**slide** (slīd), ***v.i.*** (١) خلیسکان؛ هەڵخلیسکان؛ خزان.
(٢) پێ هەڵخلیسکان؛ قاچ خزان (٣) کشان.
(٤) بەبێ خشپە رۆیشتن؛ بە دزییەوە یا بە ماتەمات رۆیشتن
(٥) لە دەست هەڵخلیسکان.
(٦) دەستکاری نەکردنی شتێك و وازلێهێنانی بۆئەوەی چی لێ دێت لێی بێت:
***( Let it ~ .; He let his affairs ~ .)***
(٧) خزان بە دەستقەست (یاری بێسبۆڵ).
***v.t.*** (١) خلیسکاندن؛ خزاندن؛ هەڵخلیسکاندن
(٢) ( ~ in; ~ into ) بە دزییەوە و بە بێ خشپە تێخستن:
***( He ~ the money into her hand.)***
***n.*** (١) خلیسکان؛ خزان؛ هەڵخلیسکان.
(٢) شوێنی قنگەخلیسکێ. (٣) لوولەخلیسکە (یاری منداڵان)؛ خلیسکە.
(٤) (ا) بەشی ئامێرێك یا مەکینەیەك کە لە کاتی کارکردندا دێت و دەچێ بە خلیسکان. (ب) میلی تفەنگ و دەمانچە. (٥) وێنەی لەسەر پەردە پیشاندراو بە شەوق هاوێژ. (٦) تەختە شووشەی شت لەسەر دانان بۆ تێڕوانینی بە گەردبین. (٧) (ا) هەرەس دان (بەرد، خۆڵ، بەفر، سەهۆڵ)؛ هەرەس بردن (ب) بەرد و خۆڵ و سەهۆڵی هەرەس بردوو.
**let side,** خستنە پشت گوێ؛ فەرامۆش کردن.
**slide fastener,** = zip-fastener.
**slide Knot** = slip-Knot.
**slide rule,** راستەی ژمارە راگر؛ راستە خلیسکە.
**slide valve,** زمانە خلسکە؛ دەمەوانە خلیسکە.
**slide-way** (slīd′wā′), ***n.*** رووبە خلیسکە؛ خلیسکە.

**sliding** (slīd′iŋ), ***adj.*** خز؛ خلیسك؛ دەخلیسكێ؛ دەگۆڕێ؛ بگۆڕ.

**sliding door,** دەرگا خلیسکە.

**sliding scale,** پێوانە خلیسکە: پێوانەیەکە دەگۆڕێ بە گوێرەی نرخ و باری شت (مووچە، کرێ، نرخ، باج ... هتد): ***( the ~ of taxes)*** .

**slight** (slīt), ***adj.*** (١) بارسکەڵە؛ باریك؛ قەد باریك؛ لەڕ؛ سووکەڵە
(٢) ناسك؛ بەرگەنەگر؛ بە تڕ بەنگە؛ لاواز؛ چرووك.
(٣) ناسەنگین؛ بێ بایەخ؛ هیچ‌وپووچ.
(٤) کەم؛ سووك؛ نەختێ: ***( a ~ fever, illness, etc.)*** .

***v.t.*** (١) بە لامسەرلایی کردن؛ بە خراپی یا ناڕێك‌وپێکی کردن
(٢) ڕێز نەگرتن؛ گوێ پێ نەدان؛ بە سووك سەیرکردن: ***( to ~ a person)*** .
(٣) بایەخ پێ نەدان؛ بە هیچ دانەنان؛ بە هیچ‌وپووچ تەماشاکردن؛ بە لامسەرلایی گرتن.

***n.*** ڕێز نەگرتن: گوێ پێ نەدان؛ بە سووك سەیرکردن؛ کارێکە ڕێز نەگرتن بگەیینێ

**-slightness *(n.)*.**

**not in the slightest,** هیچ: بە هیچ جۆرێك؛ بە هیچ چۆنێك.

**slighting** (slīt′iŋ), ***adj.*** ڕێزنەگر: ڕێز نەگرتن دەگەیینێ؛ بە سووك سەیرکەر.

**slightly** (slīt′li), ***adv.*** (١) بە لامسەرلایی؛ بەبێ گوێیانە؛ بێباکانە.
(٢) قەد باریکانە؛ باریکەلانە: ***( She is ~ built.)*** .
(٣) نەختێك؛ تۆزێك: ***( ~ ill, overweight, better, etc.)*** .

**slily** (slī′li), ***adv.*** = slyly.

**slim** (slim), ***adj.*** (١) قەد باریك؛ باریك؛ باریکەلە: ***( a ~ figure)*** .
(٢) کەم؛ کز: ***( ~ pickings: a ~ possibility)*** .
(٣) [Dial.] فێلباز؛ تەڵەکەباز.

***v.t.*** قەد باریك کردن؛ لەڕکردن.

***v.i.*** قەد باریك بوون؛ کەم بوونەوە (قورسی، قەڵەوی).

**-slimness *(n.)*.**

**slime** (slīm), ***n.*** (١) قوڕی لینج؛ ملتە؛ شتی لینج یا لیقن.
(٢) ماددەیەکی لینجە ماسی و قاقلەجنۆکە... هتد. دەری دەدەن.
(٣) پیسی؛ شتی لینج یا لیقن و پیس؛ لیقەی پیس.

***v.t.*** (١) بە شتی لینج یا قوڕی لینج داپۆشین؛ ملتە کردن بەسەردا؛ شتی لینج لێدان (٢) شتی لینج لێکردنەوە؛ پاکردنەوە (ماسی).

**slime mold,** کەڕوو لینجە

**slim-jim** (slim-jim), ***n.*** کەسێکی ڕیوەڵە؛ کەسێکی زۆر قەد باریك

**slimsy** (slim′zi), ***adj. Also*** slimpsy, [Colloq.], ناسك؛ تەنك؛ بەرگەنەگر؛ چرووك؛ هیچ‌وپووچ

**slimy** (slīm′i), ***adj.*** (١) لینج؛ لیقن
(٢) بە شتی لینج یا لیقن داپۆشراو: ماددەی لینج یا لیقن دەردەر.
(٣) پیس؛ پیس و بۆگەن.

**-slimily *(adv.)*; sliminess *(n.)*.**

**sling** (sliŋ), ***n.*** (١) قۆچەقانی؛ بەردەقانی.
(٢) slingshot (٣) هاویشتن؛ هاوێژان؛ فڕێدان.
(٤) (ا) پەت یا گوریسی شت بەرزو نزم کەرەوە؛ سلنگ (ب) قایشی تفەنگ.

***v.t.*** (١) بەرد هاویشتن بە قۆچەقانی
(٢) هاویشتن؛ هاوێژان؛ فڕێدان (٣) بەرزو نزم کردنەوە بە گوریس یا پەت
(٤) داکەوتن (وەك جۆلانێ)؛ شۆڕبوونەوە.

**-slinger *(n.)*.**

**sling** (sliŋ), ***n.*** سلنگ: خواردنەوەیەکی مەستکەرە.

**sling-shot** (sliŋ′shot′), ***n.*** دارو لاستیك

**slink** (sliŋk), ***v.i.*** بە دزییەوە هاتن و چوون؛ بەبێ خشپە جوولانەوە یا ڕۆیشتن (لە شەرمدا).

**slink** (sliŋk), ***v.t.*** بەراویتەبوون (بەتایبەتی مانگا)؛ بەر فڕێدان.

***n.*** گوێرەکەی بەراویتە؛ گوێرەکە یا بەچکەی لەبارچوو.

***adj.*** لەبارچوو (بەتایبەتی گوێرەکە).

**slinky** (sliŋ′ki), ***adj.*** (١) بێ خشپە؛ بە دزییەوە؛ بەبێ دەنگ: ***( ~ movements)***
(٢) [Slang]؛ جوان و شۆخ و شەنگ (بەتایبەتی لە جوولانەوەدا): ***( a ~ evening gown)***

**-slinkily *(adv.)*; slinkiness *(n.)*.**

**slip** (slip), ***v.i.*** (١) بە دزییەوە یا بەبێ دەنگ دەرچوون؛ بە بێ خشپە ڕۆیشتن؛ دەربازبوون: ***( He ~ped out of the house.)*** .
(٢) (ا) بەبێ دەنگ و بە خێرا ڕۆیشتن؛ کشان.
(ب) خێرا تێپەڕبوون بەبێ پێزانین: ***( The years ~ped away. Time ~ped by.)***
(٣) لە دەست دەرچوون: ***( Don't let this opportunity ~ .)*** .
(٤) گۆڕان لە بارێك یا دۆخێکەوە بۆ یەکێکی تر.
(٥) (ا) خزان و کەوتنەخوارەوە؛ خزان: ***( The plate ~ped from her hand.)***
(ب) هەڵخلیسکان: خلیسکان؛ پێ دەرچوون؛ ساتمەکردن؛ ساتمەدان.
(٦) ترازان؛ لە جێ چوون. (٧) هەڵەکردن.
(٨) دانە دواوە (تەندروستی، مێشك... هتد)؛ بەناخداچوون: ***( He has been ~ping for several years.)***
(٩) شکان (نرخ، بازاڕ، مووچە، کرێ)؛ کەم بوونەوە؛ داچوون؛ کزبوون: ***( Both prices and wages have ~ped.)***

***v.t.*** (١) تێخستن (بە خلیسکاندنە ناو شتەکەوە)؛ پیاکردن؛ خستنە ناو: ***( He ~ped the bolt through the hole.)***
(٢) گورج لەبەرکردن یا داکەندن: ***| to ~ on (off) one's clothes |***
(٣) بەبێ دەنگ یا بە دزییەوە تێخستن؛ بەبێ خشپە خستنە ناو: ***( He ~ped in a cutting remark.; to ~ a coin into a child's hand; They ~ped some kind of drug into her drink.)***
(٤) (ا) لەبیرچوونەوە؛ لەبیرنەمان: ***( It ~ped her mind.)*** .
(ب) هەڵەکردن؛ پێ نەزانین؛ هەست پێ نەکردن.
(٥) بەرەڵابوون؛ دەربازبوون.
(٦) بەرەڵاکردن (تانجی لە کاتی ڕاودا): ***( to ~ greyhounds)***
(٧) بواردن (تەقەڵ)؛ گرێ نەدان (دروومان)
(٨) بەر فڕێدان؛ بەراویتەبوون. (هەروەها " slink ").

***n.*** (١) (ا) لێژگەیەکی قەراغ ئاوە بەلەمی لێوە دەخرێتە ناو ئاوو لێوە دەهێنرێتە دەرێ. (ب) لێژگەیەکی قەراغ ئاوە کەشتی لەسەر درووست دەکرێ و چاك دەکرێتەوە. (٢) ڕست؛ پەتی سەگ؛ هەوسار؛ جڵەو. (٣) ژێر کراس.
(٤) جلی منداڵ؛ بەرگێکی منداڵە لە بەروانکە دەچێ.
(٥) بەرگە سەرین؛ بەرگە پشتی.
(٦) خلیسکان؛ خزان؛ هەڵخزان؛ ساتمە؛ قاچ دەرچوون.
(٧) لادان (لە ڕێبازی ئاسایی و چاك).
(٨) هەڵە؛ هەڵەی زمان یا پێنووس؛ لە دەم دەرچوون: ***( a ~ of the tongue)***
(٩) ڕووداوێکی ناخۆش؛ ڕێکەوتنێکی ناپەسەند.
(١٠) ڕادەی کەم‌وکووڕی کاری مەکینەیەك.
(١١) (ا) یاری کردن (مەکینە)؛ شلۆقی؛ جێی خۆ نەگرتن.
(ب) ترازان؛ لە جێ چوون. (١٢) هەرەس؛ قلیشانەوە؛ ترازان (بەرد، زەمین).

**a slip of the tongue,** لە دەم دەرچوون؛ لە زمان ترازان؛ هەڵەی زمان یا پێنووس

**give someone the slip,** خۆ لێ دەربازکردن؛ خۆ لێ دزینەوە؛ لە دەست ڕاکردن.

**let slip,** لە دەم ترازان؛ لە دەم دەرچوون؛ لە زمان ترازان.

**slip over,** زۆر گوێ پێ نەدان؛ بە لامسەرلایی گرتن.

**slip up,** [Colloq.], (١) هەڵەکردن؛ بەهەڵەداچوون.
(٢) بۆ سەر نەگرتن؛ تێکچوون؛ سەرنەکەوتن.

**slip** (slip), ***n.*** (١) قەڵەم (موتوربەکردن)؛ گۆپکەی پەیوەست کردن؛ چووز؛ خەڵف. (٢) گەنجێکی قەد باریك یا بچووك؛ خەڵف (مەجاز).

(٣) کەسێکی قەد باریک؛ کەسێکی باریکەلە.
(٤) تیرەدار؛ پارچە تەختەدارێکی درێژو تەنک‌و باریک.
(٥) پارچە کاغەزێکە شتێکی لەسەر نووسرا بێ یا ئامادە کرا بێ؛
پارچە کاغەز: ( *an order ~* ) .
(٦) تەختەی دانیشتنی کڵێسە.
*v.t.* قەڵەم لێدان؛ قەڵەم لێکردنەوە بۆ موتوربەکردن.
**slip** (slip), *n.* قوڕی شل (گڵێنەکاری).
**slip cover,** (١) بەرگە کورسی‌و قەنەفەیەکە کە پێوەی نەدووراوەو
لادەبرێ (٢) بەرگی دەرەوەی پەڕتووک کە لە بەرگە ڕەقەکەیەوە گیراوە.
**slip-knot** (slip′not´), *n.* گرێ خلیسکە.
( هەروەها " slide Knot " ).
**slip noose,** قوڵفە گرێ خلیسکە.
**slip-on** (slip′on´), *adj.* (١) بە ئاسانی لەبەر دەکرێ‌و دادەکەنرێ.
(٢) بەسەردا لەبەر دەرکرێ (وەك بلووس‌و کراسی بێ قۆپچە).
*n.* بەرگێکی بەسەردا لەبەرکراو (وەك بلووس‌و کراسی بێ قۆپچە).
**slip-over** (slip′ō´vēr), *n.* & *adj.* = slip-on.
**slippage** (slip′ij), *n.* (١) (ا) خلیسکان؛ خزان؛ هەڵخزان.
(ب) خزان (گێڕی ئوتومبیل)؛ ترازان؛ لە جێی خۆ دەرچوون؛ یاری کردن.
(٢) ڕادەی ئەم خزانە، ترازانە، یا یاری کردنە.
(٣) بێ تینی بەهۆی ئەم خزانە یا یاری کردنەوە.
**slipper** (slip′ēr), *n.* سۆل؛ نەعل؛ پێڵاوی ناومال:
( *bedroom ~s* )
**slippered** (slip′ērd), *adj.* سۆل لەپێ
**slippery** (slip′ēr-i, slip′ri), *adj.* (١) خز؛ خلیسك. ( *a ~ road* ).
(٢) دەستی لێ گیر نابێ لەبەر لیقنی یا لینجی (وەك ماسی)؛ لووس.
(٣) پشت پێ نەبەستراو؛ هەمیشە گۆڕاو؛ بێ بار؛ فێڵباز؛ قومارباز؛
جێی بڕوا نییە (٤) [Obs.]، سووك یا ناشرین (ڕەووشت)؛ ئابڕووبەر.
**slippery elm,** (١) درەختێکی بۆن خۆشە توێکڵەکەی ناوەوەی
مەڵحەمی لێ دروست دەکرێ. (٢) توێکڵی ناوەوەی ئەم درەختە کە مەڵحەمی
لێ دروست دەکرێ.
**slippy** (slip′i), *adj.* [Dial. or Colloq.]. = slippery.
**slip-sheet** (slip′shēt´), *n.* پەڕەیەك کاغەزی سپییە دەخرێتە نێوان
دوو پەڕەی تازە لە چاپ دراوەوە بۆ لەکەدار نەبوونیان بە مەرەکەبی یەکتر.
*v.t.* & *v.i.* لاپەڕەیەکی سپی خستنە نێوان دوو لاپەڕەی تازە چاپ کراوەوە.
**slip-shod** (slip′shod´), *adj.* (١) (ا) سۆل لەپێ؛
پێڵاوی پاژنە سواو لەپێ. (ب) پاژنە سواو (پێڵاو)؛ کۆنە؛ کۆن.
(٢) (ا) بێ دەربەست؛ پنتی؛ پیس‌و پۆخل؛ بە تەنگەوە نەهاتوو؛ لامسەرلا؛
بێباك (ب) بە لامسەرلایی کراو؛ تێکەڵ‌و پێکەڵ؛ بێ سەرو بن؛ خراپ (کار)؛
قەلب (کار) ( *~ work, writing, etc.* )
**slip-slop** (slip′slop´), *n.* [Colloq.]. (١) خواردنەوەی مەستکەری
ڕوون‌و بێ تام؛ شۆربای ڕوون‌و بێ تام.(٢) قسەو نووسینی هیچ‌وپووچ‌و
بێ تام
**slip-stitch** (slip′stich´), *n.* تەقەڵی شاشی ژێرەوە،ڕاتە، نەبینراو.
**slip-stream,** هەوای پاڵ پێوەنراو بۆ دواوە بە پەروانەی فڕۆکە.
**slipt** (slipt), *archaic or poetic past tense of* **slip.**
**slip-up** (slip′up´), *n.* [Colloq.]. هەڵە
**slip-way** (slip′wā´), *n.* لێژکەیەکە لە کەشتیگا یا قەرنخ ناوەدا بۆ
دروستکردن‌و چاککردنەوەی کەشتی‌و بەنەوەر کەشتی خستنە ئاو دوو ئێوە
دەرهێنانە دەرەوە (هەروەها " slip # 1 ").
**slit** (slit), *v.t.* (١) هەڵدڕین لە درێژی دا؛ هەڵدڕین‌و کردنەوە.
(٢) تۆزی تۆزی خرت یا بڕینەوە بە پارچەی باریک باریک لە باری درێژی.
(٣) هێڵی؛ قڵیش؛ درز.
( *The ~ under the door lets in light. The ~ in her skirt.* )
**slither** (slith′ēr), *v.i.* (١) خزان؛ خلیسکان؛ هەڵخزان.
(٢) خشان وەك مار؛ وەك مار ڕۆیشتن
*v.t.* هەڵخزاندن؛ هەڵخلیسکاندن.
*n.* خزان؛ خلیسکان؛ کشان وەك مار.
**slithery** (slith′ēr-i), *adj.* (١) خز؛ خلیسك.
(٢) لە خلیسکان یا کشان دەچێ: ( *~ walk* ) .
**sliver** (sliv′ēr), *n.* (١) تەڵەزم (دار، بەرد، بۆمبای تەقیو).
(٢) تاڵە موو، خوری، لۆکە، یا کەتانی خاو، ڕیشاڵ.
*v.t.* تەڵەزم تەڵەزم کردن؛ تەڵەزم لێکردنەوە.
*v.i.* بوون بە تەڵەزم؛ تەڵەزم لێبوونەوە.
**slivovitz** (sliv′ə-vits´), *n.* خواردنەوەیەکی مەستکەری وڵاتە
سلاڤییەکانە.
**slob** (slob), *n.* [Dial.], (١) قوڕ.
(٢) شوێنێکی قوڕو چڵپاوی؛ شوێنێکی لیتاوی.
(٣) [Colloq.]، کەسێکی گەلحۆی پنتی پیس‌وپۆخڵی بێزارکەری نەزانی
شت بە ناڕێك‌وپێکیکەر.
**slobber** (slob′ēr), *v.i.* (١) لیك لە دەم هاتن؛ لیك دەردان.
(٢) بە سۆزەوە قسەکردن؛ هەستی بەسۆز دەبڕین (دڵداری).
*v.t.* لیکاوی کردن؛ پیس کردن بە لیك یا خواردنی لە دەمەوە کەوتەخوارەوە:
( *The baby has ~ed his coat.* )
*n.* (١) لیك. (٢) قسەو نووسینی زۆر بەسۆزو منداڵانە.
**slobber over someone,** زۆر هەستی خۆشەویستی بەرامبەر دەربڕین؛
پەرستن؛ ئاوی دەم بۆ تکان.
**slobbery** (slob′ēr-i), *adj.* (١) لیقن؛ تەڕو ناخۆش؛ لینج؛ لیکاوی؛
لیکن. (٢) بەسۆزو منداڵانە (دووان، نووسین).
**sloe-eyed** (slō′īd´), *adj.* چاو ڕەش‌و گەورە.
**sloe gin,** جن: خواردنەوەیەکی مەستکەرە.
**slog** (slog), *v.t.* & *v.i.* = slug.
**slog** (slog), *v.i.* (١) بە هێواشی‌و بە زەحمەت ڕۆیشتن بەڕێوە؛
هەنگاوی هێواش‌و وورد هەڵهێنانەوە.
(٢) ڕەنج دان؛ زۆر ئیش کردن؛ ئارەق ڕشتن.
*n.* (١) ئیشی زۆرو گران؛ ڕەنج.
(٢) ڕۆیشتنێکی دوورو درێژو گران‌و ماندووکەر.
-slogger *(n.)*.
**slogan** (slō′gən), *n.* (١) هاواری جەنگی خێڵە ئوسکوتلەندییەکانی
کۆن. (٢) درووشم (بەتایبەتی هی حیزب، ڕێکخراو، دەزگا...هتد)؛ ئاڵا.
(٣) درووشمی دەزگایەکی بازرگانی بۆ شت فرۆشتن.
**sloid, slojd** (sloid), *n.* = sloyd.
**sloop** (sloōp), *n.* بەلەمی بایەوانی یەك ستوونی یا دار.
**sloop of war,** بەلەمی بچووکی جەنگ.
**slop** (slop), *n.* (١) لیتاو؛ لیتە؛ قوڕو لیتە.
(٢) چاڵاوی پیس؛ ئاوو شلەی ڕژاو یا هەڵپڕژاو.
(٣) شۆرباو خواردەمەنی تری ڕوون‌و بێ تام.
(٤) (*pl.*) بەرماوە (کە دەدرێ بە گیاندار)؛ پاشماوە.
(٥) (*pl.*) ملتەی پاشماوەی خواردنەوەی مەستکەر دروستکردن.
(٦) (*pl.*) گوو؛ پیسایی.
(٧) نووسین‌و دووانی لە ئەندازە بەدەر بە سۆزو بێ تام.
(٨) [Slang]، کەسێکی گەلحۆی پنتی پیس‌و پۆخڵی شت بە ڕێك‌وپێکی
نەکەر.
*v.i.* (١) ڕژان؛ هەڵپڕژاندن. (٢) ڕژان (لەبەر پڕی دەفری شلە).
(٣) ( *~ over* ) لە ڕادە بەدەر بە سۆزەوە دووان.
(٤) بە هەنگاوی ووردو قورس‌و هێواش ڕۆیشتن (وەك بەناو قوڕدا).
*v.t.* (١) ڕژاندن (بە خوارکردنەوەی دەفری شلە).
(٢) شلە یا ئاو پیاکردن؛ ئاوو شتی شل بەسەردا ڕژاندن.
(٣) نان تێکردن بە نەزانانەو ناقۆڵایانە. (٤) بەرماوە دان بە چوارپێ.
slop over, (١) ڕژان؛ ڕژاندن؛ بەسەردا ڕژاندن.
(٢) [Colloq.]. لە ئەندازە بەدەر بە سۆزەوە دووان.

**slop** (slop), ***n.*** (۱) جلو بەرگو پێخەفی دابەش کراو بەسەر کەشتیواندا.
(۲) (*pl.*) پانتۆڵو پانتۆڵی کورتی دەڵب (لە سەدەی شانزەدا لەبەرئەکرا).
(۳) بەرگی ئاودامانی دەرەوەی دەڵب.
(٤) (*pl.*) جلی فەردە؛ جلو بەرگی ئامادەی هەرزان.

**slope** (slōp), ***n.*** (۱) لێژگە؛ لێژایی؛ لێژی؛ قەد پاڵ؛ قەد شاخ؛ قەد گرد؛ پاڵ؛ بەرەو خوارکە؛ بەرەوژوورکە. (۲) ئەندازەی ئەم لێژییە.
***v.i.*** لێژبوونەوە؛ بەرەوخواربوونەوە؛ بەرەوژووربوونەوە؛ خواربوونەوە.
***v.t.*** خوارکردنەوە؛ لێژکردنەوە.

**sloping** (slōp′iŋ), ***adj.*** بەرەو خوار؛ بەرەو ژوور؛ خوار؛ لار.

**sloppy** (slop′i), ***adj.*** (۱) قوراوی.
(۲) شتی پیس لێ هەڵپڕژاو؛ پیس؛ لەکەدار (بە شلە پڕژان بەسەردا).
(۳) ڕوون و بێ تام: *( a ~ stew)* .
(٤) [Colloq.]، پیسوپۆخڵ؛ پیس؛ پنتی؛ شلوشێواو؛ ناڕێکوپێک.
(٥) [Colloq.]، بە لاسەرلایی کراو؛ تێکەڵوپێکەڵ؛ بێ سەروبن؛ خراپ (کار): *( ~ work, writing, etc.)* .
(٦) [Colloq.]، لە ئەندازە بەدەر بەسۆزو منداڵانە: *( ~ sentiment)* .
**-sloppily** ***(adv.)***; **sloppiness** ***(n.)***.

**slop-shop** (slop′shop′), ***n.*** فرۆشگای جلی ئامادەو هەرزان؛ فرۆشگای جلی فەردە.

**slop-work** (slop′wûrk′), ***n.*** (۱) جلی ئامادەو هەرزان یا فەردە دروستکردن. (۲) ئەم جۆرە جلە بەگشتی.
(۳) کاری بێ سەروبن؛ کاری تێکەڵوپێکەڵ یا ناڕێکوپێک.

**slosh** (slosh), ***v.t.*** (۱) تێکدان (شلە)؛ ژەندن؛ ڕاوەشاندن.
(۲) ڕاوەشاندن لە شلەیەکدا؛ بە توند بزواندن لەناو شلەیەکدا:
***( ~ clothes in soapy water.)***
***v.i.*** بە شڵپە شڵپ بە لیتاودا ڕۆیشتن.
***n.*** شڵپەشڵپ؛ شڵپە؛ دەنگی شڵپەشڵپ.

**slot** (slot), ***n.*** قڵیش؛ تلیش؛ درز؛ کون (وەك ئەو کونەی مەکینەی شت فرۆش کە پارەی ووردەی تێ دەخرێ).
***v.t.*** قڵیش تێکردن؛ تلیش تێکردن؛ کون بۆ کردن.

**slot** (slot), ***n.*** شوێن پێی گیاندار (بەتایبەتی ئاسك)؛ سمی ئاسك.
***v.t.*** شوێن پێ هەڵگرتن.

**sloth** (slōth, slôth, sloth), ***n.*** (۱) تەمەڵی؛ سستی؛ خاوی؛ لەش قورسی. (۲) گیاندارێکی شیردەری سستی چنگداری ئەمەریکای باشوورە لەناو درەختدا دەژی.

**sloth bear,** وورچێکی هیندستانی تیسك درێژو چنگ درێژو سپییە.

**slothful** (slōth′fəl, slôth′fəl, sloth′fəl), ***adj.*** تەمەڵ؛ سست؛ خاو؛ لەش قورس.

**slot machine,** مەکینەی شت فرۆشتن یا قومار کە لە درزێکەوە پارەی ووردەی تێ دەخرێ تاکو ئیش بکات.

**slouch** (slouch), ***n.*** (۱) کەسێکی تەمەڵو لێ نەهاتوو؛ کەسێکی گێلۆکە یا ناکارامە. (۲) شان داچەکان؛ شان داچەکاوی؛ شان داکەوتن.
(۳) داکەوتن (وەك لێواری شەپقە)؛ شۆڕبوونەوە؛ داچەکان.
***v.i.*** (۱) شان داچەکان؛ بە شان داچەکانەوە وەستان، دانیشتن. یا ڕۆیشتن بەڕێوە. (۲) داکەوتن (لێواری شەپقە)؛ داچەکان.
***v.t.*** داچەکاندن

**slouch hat,** شەپقەیەکی نەرمی قەراغ پانو داچەکاوە.

**slouchy** (slouch′i), ***adj.*** شان داچەکاو

**-slouchily** ***(adv.)***; **slouchiness** ***(n.)***.

**slough** (sluf), ***n.*** (۱) کاژە مار؛ کاژ.
(۲) توێڵ. (۳) گۆشتی تۆپیوی مردوو (پزیشکانی).
***v.i.*** (۱) فڕێدان (کاژ، توێڵ).
(۲) ~ **off**: جیابوونەوەی شانەی مردوو لە شانەی زیندووی دەوروپشتی.
***v.t.*** (۱) فڕێدان (کاژ، توێڵ).
(۲) ~ **off**: تەرك کردن؛ واز لێ هێنان *( to ~ off a bad habit)*.

(۳) فڕێدانی کاغەزێکی بێ کەڵك (قومار، یاری کاغەز).

**slough** (slou), ***n.*** (۱) چاڵەقوڕ؛ چاڵە قوڕاویتە.
(۲) گەنداو؛ زەلکاو؛ زۆنگاو؛ ئەستێلی پیس.
(هەروەها " **slew** " وە " **slue** ").
(۳) دڵپیسی؛ دڵتەنگی؛ کۆست کەوتن؛ بێ هیوایی.
(٤) بەناخداچوون؛ نزمی؛ ڕیسوایی.

**sloughy** (sluf′i), ***adj.*** کاژی؛ وەك کاژە مار؛ هی شانەی مردوو؛ هی توێکی مردوو.

**sloughy** (slou′i), ***adj.*** زۆنگاوی؛ گەناوی؛ قوڕاوی.

**Slovak** (slō′vak, slō-vak′, slō′väk), ***n.*** (۱) سلۆڤاکی؛ کەسێکی سلۆڤاکی. (۲) زمانی سلۆڤاکی.
***adj.*** سلۆڤاکی؛ تایبەتی بە سلۆڤاکیاو گەلو زمانەکەی.

**Slovakian** (slō-vä′ki-ən, slō-vak′i-ən), ***n. & adj.*** = Slovak.

**sloven** (sluv′ən), ***n.*** کەسێکی پنتیو پیسو پۆخڵ؛ کەسێکی شلو شێواو و پیس.

**Slovene** (slō-vēn′, slō′vēn), ***n.*** (۱) سلۆڤینی؛ هاوڵاتییەکی سلۆڤینیا لە یوگوسلاڤیا. (۲) زمانی سلۆڤینی.
***adj.*** سلۆڤینی؛ تایبەتی بە سلۆڤینیاو گەلو زمانەکەی.
(هەروەها " **Slovenian** ").

**slovenly** (sluv′ən-li), ***adj.*** (۱) چەپەڵ؛ پیسو پۆخڵ؛ پنتی؛ پۆخڵ.
(۲) **slipshod** .
**-slovenliness** ***(n.)***; **slovenly** ***(adv.)***.

**slow** (slō), ***adj.*** (۱) گێل؛ گەوج؛ دەبەنگ؛ کەودەن؛ نازیرەك؛ بێ مێشك؛ کۆڵ. (۲) خاو؛ خاوو خلیچك؛ سست؛ خاویلکە.
(۳) (ا) هێواش؛ لەسەرخۆ: ***( a ~ runner)*** .
(ب) هێواش؛ کات زۆر دەبات: ***( a ~ train, journey, etc.)*** .
(٤) لە دوا (کاتژمێر): ***( My watch is five minutes ~ .)*** .
(٥) دواکەوتوو؛ لەکاتی خۆیدا نەکراو.
(٦) سارد (بازاڕ): ***( a ~ market)*** .
(۷) کۆنباو؛ کۆنەپەرست.
(۸) ووشك و ناخۆش: ***( a ~ party, afternoon, etc.)*** .
(۹) زۆری پێ دەچێ؛ لەسەرخۆ: ***( ~ growth)*** .
***v.t.*** (۱) هێواش کردنەوە؛ خاوکردنەوە؛ هێواشتر کردنەوە.
(۲) ( ~ **up**; ~ **down** ) دواخستن؛ ڕێ لێ گرتن؛ کۆسپ خستنە ڕێ.
***v.i.*** **( ~ up; ~ down),** هێواش بوونەوە؛ خاوبوونەوە؛ هێواشتر بوونەوە.
**-slowness** ***(n.)***.

**slow-down** (slō′doun′), ***n.*** هێواش کردنەوەی دەستقەستکاری کارگەیەك لەلایەن کرێکارەکان یا خاوەن کارەوە.

**slowly** (slō′li), ***adv.*** بە هێواشی؛ لەسەرخۆ؛ بە شێنەیی؛ وورده وورده؛ بەرەبەرە.

**slow match,** پلیتە یا فیوزی هێواش سووتاو (بۆ تەقاندنەوەی تەقەمەنی).

**slow-motion** (slō′mō′shən), ***adj.*** (۱) هێواش.
(۲) تایبەتی بە فیلمی هێواش کراوە.

**slow-poke** (slō′pōk′), ***n.*** [Slang], کەسێکی خاورخلیچك.

**slow-witted** (slō′wit′id), ***adj.*** کۆڵ؛ کەودەن؛ بێ مێشك؛ گێل.

**slow-worm** (slō′wûrm′), ***n.*** = blindworm.

**sloyd** (sloid), ***n. Also*** sloid, slojd, شێوەیەکی سویدییە بۆ فێرکردنی ئامێر بەکارهێنان و دەستکاری بەهۆی تەختەکاری و درتاشییەوە

**slub** (slub), ***n.*** (۱) گرێی ڕیس؛ بە گرێ وەستانی دەزوو.
(۲) ڕیس؛ ڕیسی.
***v.t.*** بادان (خوری، موو، لۆکە)؛

**slubber** (slub′ēr), ***v.t.*** (۱) پیس کردن؛ لەکەداری کردن؛ شت بەسەرداڕژان و لەکەدار کردن. (۲) بە لاسەرلایی و نەزانانە کردن؛ تێکدان؛

خراپ کردن

**sludge** (sluj), *n.* (١) قوڕ ـ هی سەرزەمین یا بنی ئەستێل‌و ڕووبار؛ لیتە. (٢) حلتە؛ بەڵغ (٣) پارچە سەهۆڵی شکاوی سەرئاو.

**-sludgy** *(adj.)*.

**slue** (sloo̅), *v.t. & v.i. Also* **slew**, بادان؛ با پێدان؛ سووڕاندنەوە؛ خولاندنەوە.

*n.* (١) بادان؛ با پێدان؛ سووڕانەوە؛ خولانەوە.
(٢) ئەو بارەی کە شتێکی بۆ با دەدرێ یا دەسووڕێنرێتەوە.

**slue** (sloo̅), *n.* = **slough.**

**slue** (sloo̅), *n.* = **slew.**

**slug** (slug), *n.* (١) ملە: گیاندارێکی نەرمی لینجە لە کۆمەڵەی شەیتانۆکە گژوگیا و ڕووەکی باخچە دەخوات. (٢) کرمۆکەی نەرم‌و لووسی هەندێ جانەوەر. (٣) [Colloq.]: کەسێکی تەمەڵ‌و تەوەزەل؛ گیاندارێك یا ئوتومبیلێکی خاو.

**slug** (slug), *n.* (١) گوللە؛ فیشەك؛ ساچمە.
(٢) پارچە کانزایەکە ئەوەندەی پارەیەکی وردە دەبێت‌و لەباتی پارە بە قاچاخی دەخرێتە ناو مەکینەی شت فرۆشتنەوە.
(٣) تۆپەلە کانزا یا شووشەی ئامادەکراو بۆ شت لێ دروستکردن.
(٤) پەرە کانزای تەنك‌و باریك بۆ دێڕ جیاکردنەوە (چاپکاری).

**slug** (slug), *n.* [Slang], پێکی یەکسەری خواردنەوەی مەستکەر.

**slug** (slug), *v.t.* [Colloq.], مستەکوڵە لێدان؛ بە توند مستەکۆڵە پیاکێشان.

*n.* [Colloq.], مستەکۆڵە؛ مستەکۆڵەی توند.

**slugabed** (slug'ə-bed´), *n.* کەسێکی تەمەڵی درەنگ لەخەوهەڵساو.

**sluggfest**, (١) شەڕە مستەکۆڵەی دڕندانە.
(٢) یاری "بێسبۆل"ی بە تین یا چوست‌و چالاك.

**sluggard** (slug'ērd), *n.* کەسێکی تەمەڵ‌و تەوەزەل‌و خاو.

*adj.* تەمەڵ؛ خاو؛ سست؛ هێواش.

**sluggish** (slug'ish), *adj.* (١) خاو؛ سست؛ خاووخلیچك؛ بێ تاقەت؛ تەمەڵ (٢) سارد (بازاڕ)؛ بێ جموجووڵ؛ کز (بازاڕ):
***( a ~ economy, market, etc.)***

**sluice** (sloo̅s), *n.* (١) بەنداوی دەرگادار.
(٢) دەرگای بەنداو یا بەست (بۆ دابینکردنی ئاوی ڕووبار، دەریاچە یا ئەستێل). (هەروەها " **sluice gate** "). (٣) ئاوی دابینکراو بەم جۆرە دەرگایە.
(٤) جۆگە (بەتایبەتی هی ئاوی زیادە).
(٥) جۆگەی لێژ بۆ شۆردنەوەی لم‌و خۆڵی زێڕاوی یا دارو دەستەك گواستنەوە.

***v.t.*** (١) ئاوی عەمباراو یا دەریاچە بەرەڵاکردن لە دەرگاوە.
(٢) (أ) شۆردنەوەی لم‌و خۆڵی زێڕاوی بە ئاوی خوڕ.
(ب) شۆردن بە ئاوی خوڕ؛ ئاوی خوڕ پیاکردن:
***( The sailors ~d the deck with hoses.)***
(٣) دارو دەستەك گواستنەوە بە جۆگەی خوڕ.

***v.i.*** لێوەهاتن (ئاو)؛ بە جۆگە یا دەرگای عەمباراودا ڕۆیشتنی ئاو.

**sluice-way** (sloo̅s'wā´), *n.* جۆگەی دەستکرد.

**slum** (slum), *n.* گەڕەکی هەژاران؛ گەڕەکێکی قەرەباڵغی پەڕپووتی پیس‌وپۆخڵی گوێ پێ نەدراوە

***v.i.*** سەردان لەم جۆرە گەڕەکە؛ چوونە گەڕەکێکی وەها: ***( go ~ming)*** .

**slumber** (slum'bēr), *v.i.* (١) نوستن؛ خەوتن؛ چاو چوونەخەو؛ کەروێشکەخەوکردن. (٢) خامۆش بوون؛ کپ بوون؛ سڕبوون؛ نەجووڵانەوە.

***v.t.*** بە خەو بردنەسەر؛ بە نوستن بردنەسەر.

*n.* (١) نوستن؛ خەو؛ کەروێشکەخەو
(٢) خامۆشی؛ کپی؛ سڕی؛ نەجووڵان.

**slumberous** (slum'bēr-əs), *adj.* (١) خەوالوو
(٢) (أ) خامۆش؛ کپ؛ بێ دەنگ؛ نوستوو؛ هێمن (ب) لە نوستن دەچێ.
(٣) خەولێخەر؛ نوێنەر.

**slumbrous** (slum'brəs), *adj.* = **slumberous.**

**slump** (slump), *v.i.* (١) لە پڕ کەوتن؛ داکەوتن؛ تلیسانەوە (مەجاز)؛ هەرەس بردن (مەجاز).
***( Tired from his walk, he ~ed into a chair.)***
(٢) نوقوم بوون لەناو قوڕاو، زەلکاو، یا بەفردا؛ پێ داچوون؛ داچوون.
(٣) لەپڕ شکان (نرخ، بازاڕ)؛ لە پڕ چوونەخوارەوە (نرخ)؛ بەناخداچوون.
(٤) شان داچەکان.

*n.* (١) لە پڕ کەوتن؛ لە پڕ کەوتنەخوارەوە.
(٢) لە پڕ شکان یا چوونەخوارەوە (نرخ)؛ بێ بازاڕی: ***( an economic ~ )*** .

**slung** (sluŋ), *past tense and past participle of* **sling.**

**slung-shot**, پارچەیەك ئاسن یا بەردی بەستراوە بە سەری قایشێکەوەو وەك چەك بەکاردەهێنرێت.

**slunk** (sluŋk), *past tense and p.p. of* **slink # 1.**

**slunk** (sluŋk), *alternative past tense and p.p. of* **slink # 2.**

**slur** (slûr), *v.t.* (١) بە پەلە بەسەردا ڕۆیشتن یا باسکردن؛ بە کورتی باسکردن؛ پەڕاندن؛ زۆر گوێ پێ نەدان:
***( He ~red over the dead man's faults and spoke chiefly of his virtues.)***
(٢) ووشە قووتدان یا پەڕاندن لە قسەکردندا؛ زمان تێکئالان؛ زمان تەتەڵەکردن.
(٣) [Dial.]، لەکەدارکردن؛ پیس کردن.
(٤) لەکەدارکردن (چاپکاری)؛ پەڵەدارکردن.
(٥) سووك کردن؛ ناوزڕاندن؛ ناو پیس کردن؛ ناو لەکەدارکردن.
(٦) (أ) دوو گۆرانی جیا ووتن یا دوو ئاوازی مۆسیقای جیا لێدان بەبێ وەستان. (ب) نیشانەکردنی نۆتەی مۆسیقا.

*n.* (١) بە پەلە یا بە کورتی باسکردن؛ درێژە پێ نەدان.
(٢) ووشەی قووتدراو یا پەڕێنراو لە قسەکردندا.
(٣) پەڵە؛ لەکە؛ لکە. (٤) لەکەداری؛ لەکە؛ سووك کردن؛ ناوسووکی؛ ناوپیسی. (٥) (أ) ئاوازی جیاوازی لێکدراو یا تێهەڵکێشراو.
(ب) نیشانەی ئەم لێکدانە یا تێهەڵکێشانە.

**slurp** (slûrp), *v.t. & v.i. & n.* هەڵقوڕاندن (شۆربا، شلە)؛ هەڵلووشین.

**slurry** (slûr'i), *adj.* چیمەنتۆی شل؛ گەچاو؛ قوڕولیتە؛ قوڕاو؛ پارچەی ووردی نەتواوەی ناو ئاو.

**slush** (slush), *n.* (١) بەفرو سەهۆڵی نیوە چووەوە؛ لیتاو؛ لیتەی بەفرو سەهۆڵ. (٢) قوڕولیتە؛ لیتە؛ قوڕو چڵپاو.
(٣) پاشماوەی ڕۆنی چێشت لێنانی ناو کەشتی.
(٤) ڕۆنی مەکینە چەورکردن (بۆ ژەنگ نەگرتن).
(٥) نووسین‌و قسەی لە ئەندازە بەدەر بەسۆز.

*v.t.* (١) مەکینە چەورکردن بە ڕۆن (بۆ ژەنگ نەگرتن).
(٢) ( **up ~** ) درزو کونی دیوار پڕکردنەوە بە قوڕو قسڵ؛ گەچ لێدان؛ بە قوڕو قسڵ پینەکردن.
(٣) داشۆرین بە سۆندە (زەمینەی کەشتی)؛ شۆردن بە ئاوی خوڕ.
(٤) قوڕاو لێ هەڵپرژاندن؛ لیتاوی بەفر لێ هەڵپرژاندن.

*v.i.* بەناو لیتاو یا بەفرو سەهۆڵی چوراوەدا ڕۆیشتن.

**slush fund**, (١) دەسکەوتی فرۆشتنی پاشماوەی شتومەکی کەشتی کە وورده شتی پێ دەکڕدرێت بۆ کەشتیەوانەکان.
(٢) (أ) سنووقی بەرتیل: ئەو پارەیەیە کە تەرخان کراوە لەلایەن دەسگایەکەوە بۆ بەرتیل دان بە کاربەدەستان‌و بۆ کاری قەدەغەی تری وەها.
(ب) پارەیەکە کە فەرمانبەرانی دەسگایەك لە خۆیانی کۆ دەکەنەوە بۆ ئاهەنگ گێڕان‌و سەیران‌و...هتد.

**slushy** (slush'i), *adj.* (١) لیتاوی؛ بە لیتاوی بەفرو سەهۆڵ داپۆشراو:
***( ~ street)***
(٢) لە لیتاوی بەفر دەچێ؛ نیمچە تواوەیە؛ لە بەفرو سەهۆڵی نیوە تواوە دەچێ: ***( ~ snow; a ~ mixture)*** .
(٣) هیچ‌وپووچ‌و بەسۆز لە ئەندازە بەدەر: ***( a ~ novel)*** .

**slut** (slut), *n.* (١) ئافرەتی پیس‌وپۆخڵ؛ ژنی چەپەڵ.
(٢) قەحبە؛ فلقێ؛ ئافرەتی سووك.

(۳) کچێکی چەقاوەسوو، بێ حەیا، یا چاوقایم (لەڕووی گاڵتەوە).

(٤) دێڵ؛ دەلەسەگ؛ سەگی مێ

**sluttish** (slut′ish), *adj.* (۱) چەپەڵ؛ پیس‌وپۆخڵ.

(۲) قەحبانە؛ سووک؛ لە قەحبە دەچێ.

**sly** (slī), *adj.* (۱) فێڵباز؛ تەڵەکەباز؛ ئۆینباز؛ زۆرزان؛ زۆڵ.

(۲) نهێنباز؛ پەنهانباز؛ لە ژێرەوە شت کەر. (۳) بە گۆبەن؛ کەتنباز.

**on the sly,** بە دزییەوە؛ لە ژێرەوە؛ بە نهێنی.

**slyly, slily** (slī′li), *adv.* بە دزییەوە؛ لە ژێرەوە؛ بە نهێنی؛ بە زۆڵانە.

**slype** (slīp), *n.* ڕاڕەو یا دالانی نێوان کڵێسەو ماڵی قەشە.

**smack** (smak), *n.* (۱) تام؛ بۆن و بەرامە؛ تامێکی کەم؛ چەژ.

(۲) نەختێک؛ تۆزێک؛ تۆسکاڵێک.

*v.i.* (۱) تامێکی تایبەتی هەبوون؛ تام لەوە چوون:

*( The medicine ~s of sulphur.)*

(۲) ( of ~ ) بۆنی ئەوە لێ هاتن (مەجاز)؛ لەوەچوون؛ وا گەیاندن:

*( This ~s of foul play.)*

**smack** (smak), *n.* (۱) شەقەی لێو (ماچ، تام کردنی شتی مزرو خۆش‌و توون)؛ شڵپەی لێو.

(۲) ماچی شەقە لێ هەڵسێنراو؛ شەقەی ماچ: *( ~ on the lips.)* .

(۳) زللە؛ شەقازلە؛ شەپازلە؛ شەپلاخ.

(٤) شەقەی زللە؛ شەقەی قامچی یا شووڵ لێدان.

*v.t.* (۱) شەقە لە لێو هەڵساندن (لە تام کردنی شتی مزرو خۆش‌و تووندا):

*( to ~ one's lips)*

(۲) ماچ کردن و شەقە لە لێو هەڵساندن؛ شەقە لە لێو هەڵساندن لە ماچ کردندا.

(۳) شەقەی زللە هاتن؛ شەپازلە یا قامچی لێدان‌و شەقە لێ هەڵساندن:

*( to ~ a naughty child)*

*v.i.* شەقە لێ هەڵسان؛ شڵپە لێ هەڵسان.

*adv.* (۱) بە شەقە؛ بە شڵپە: *( The child fell ~ on her hand.)* .

(۲) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ: *( The car went ~ into the wall.)* .

**smack** (smak), *n.* (۱) بەلەمی بایەوانی یەک ستووندار.

(۲) بەلەمێکی ڕاوەماسییە کە حەوزێکی تێدا بێ بۆ تێخستنی ماسییەکان‌و نەمردنیان

**smacker** (smak′ẽr), *n.* (۱) ماچێکی زل؛ ماچی شەقە لێ هەڵسێنراو.

(۲) شەپازلە؛ زللە؛ شەقازلە؛ شەپلاخ. (۳) [Slang]، دۆلار.

**smacking** (smak′iŋ), *adj.* بەتین؛ قایم؛ خێرا؛ توند

*( a ~ breeze)*

**small** (smôl), *adj.* (۱) بچووک؛ بچووک (لە چاو شتی هاوجۆردا):

*( a ~ animal, town, room, audience, etc.)*

(۲) (ا) کەم: *( a ~ income, amount, etc.)* .

(ب) کەم (ژمارە) *( a ~ number of people)*

(۳) بچووک (لە ڕووی سەرمایەوە):

*( a ~ business, businessman, farmer, etc.)*

(٤) هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ؛ شایانی باس نییە.

(٥) بچووک (پلەوپایە)؛ ئاسایی؛ گەند (پلەوپایە).

(٦) مێشک تەسک؛ ناپیاو؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ: *( ~ people)*

(۷) کز (دەنگ)؛ نەرم (دەنگ)؛ نەسپایی. (۸) ڕوون (خواردنەوە).

*adv.* (۱) بە پارچەی بچووک بچووک: *( Cut it up ~ .)* .

(۲) بە دەنگی نزم

(۳) هیچ و پووچانە؛ بە ڕادەیەکی کەم؛ بە ترس‌و لەرزەوە؛ کەم.

*n.* (۱) شتێکی بچووکتر لەوانی تر.

(۲) (*pl.*) ووردەشت؛ شتی وورده. (۳) (*pl.*) small-clothes .

-smallness *(n.)*.

**feel small,** تەریق بوونەوە؛ شەرمەزاربوون؛ ڕووڕەش بوون؛ ڕیسوابوون.

**no small,** زۆر؛ نێجگار زۆر؛ کەم نا

*( There was no small excitement about the news.)*

**smallage** (smôl′ij), *n.* کەرەوورزە کێویلە

**small arms,** چەکی بچووک (وەک تفەنگ‌و دەمانچە).

**small beer,** (۱) بیرەی خراپ؛ بیرەی ڕوون.

(۲) کەسێک یا شتێکی هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ؛ شتی ناگرنگ.

**small capital,** تیپی گەورەی قەبارە بچووک.

**small change,** (۱) پارەی ووردەی کەم نرخ؛ ووردەی کەم نرخ.

(۲) شتی هیچ‌وپووچ‌و کەم بایەخ.

**small-clothes** (smôl′klōthz′), *n.pl.* (۱) پانتۆڵی کورت‌و تەسکی پیاوانە (لە سەدەی هەژدەهەمدا بەباو بوو).

(۲) [British]، ووردە جل (وەک فانیلەو دەرپێ‌و دەسەسڕ... هتد) (هەروەها " smalls ").

**small fry,** (۱) ماسی بچووک؛ بەچکە ماسی.

(۲) منداڵی وورد؛ منداڵی بچووک؛ منداڵ.

(۳) کەس یا شتی هیچ‌وپووچ‌و ناگرنگ.

**small game,** نێچیری ڕاوی بچووک.

**small hours,** کاتی دوای ساتی دوانزەی نیوەشەو؛ دوای نیوەشەو.

**smallish** (smôl′ish), *adj.* نەختێک بچووک؛ تۆزێک بچووک.

**small intestine,** ڕیخۆڵە بچکۆلە.

**small-minded** (smôl′min′did), *adj.* بیرتەسک؛ تێنەگەیشتوو؛ خۆپەرست؛ هیچ‌وپووچ.

-small-mindedly *(adv.)*; small-mindedness *(n.)*.

**small of the back,** چاڵایی لاخوارووی پشت لەسەروو سمتەوە.

**small potatoes,** [Colloq.], (۱) کەسێک یا شتێکی هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ. (۲) کەسان یا شتی هیچ‌وپووچ‌و ناگرنگ.

**small-pox** (smôl′poks′), *n.* ئاوڵە.

**small stores,** ووردە بابەت؛ فرۆتەنی وەک تووتن‌و جگەرەو سابوون کە لە دوکانی کەشتیدایە بۆ فرۆشتن بە کەشتییەوانەکان.

**small-sword** (smôl′sôrd′, smôl′sōrd′), *n.* شیری شیربازی.

کە بریتییە لە شیشێکی باریکەڵەی دەسکدار.

**small talk,** دەمەتەقێ دەربارەی شتی هیچ‌وپووچ‌و بێ بایەخ.

**small-time** (smôl′tīm′), *adj.* [Slang], هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ؛ بچووک؛ هیچ: *( ~ hoodlums)* .

**smalt** (smôlt), *n.* (۱) بۆیەی شین. (۲) ڕەنگی شین؛ شین.

**smaltite** (smôl′tīt), *n. Also* smaltine, کانزایەکی سپی‌و زیوییە.

**smalto** (zmäl′tô), *n.* (۱) شووشەی ڕەنگاوڕەنگ.

(۲) پارچەیە لەم شووشەیە.

**smaragd** (smar′agd), *n.* زەمڕووت: بەردێکی بەنرخی سەوزە.

**smarmy,** بەسەرزاری بە دەربەستەوە هاتوو؛ لەخۆڕازی‌و خۆبەرەپێشەوە: *( a ~ magazine article)* .

**smart** (smärt), *v.i.* (۱) چووزانەوە؛ تووزانەوە؛ کزانەوە؛ برژانەوە؛ گل کردن: *( Iodine ~s when it is put on a cut.)* .

(۲) هەست بە چووزانەوە کردن؛ هەست بە ئازار کردن؛ ئازار گەیین

(۳) سوێ چەشتن؛ پەشیمان بوونەوە؛ تووشی ئەشکەنجە بوون.

(٤) ( for ~ ) سزا چەشتن؛ سزا خواردن.

*n.* سوێ؛ ئەشکەنجە؛ ئازار؛ ئێش‌و ئازار.

*adj.* (۱) (ا) زیرەک؛ زرنگ؛ دانا: *( a ~ person)* .

(ب) زیرەکانە؛ دانایانە: *( a ~ answer)* .

(۲) خێرا؛ گووڕج: *( a ~ pace)* .

(۳) زۆرزان؛ سەردەرچوو؛ ووریا؛ چاپک؛ گوستاخ: *( a ~ businessman)* .

(٤) پۆشتەوپەرداخ؛ شۆخ (جل‌وبەرگ)؛ تەڕپۆش؛ قۆز: *( a ~ dress)* .

(٥) بەباو؛ مۆدە؛ شۆخ: *( a ~ restaurant)* .

-smartness *(n.)*.

**smart aleck** (smärt-al′ik), [Colloq.], کەسێکە کە شانازی بە زۆرزانی خۆیەوە دەکات‌و خەڵک پەست دەکات؛ کەسێکی خۆ بە زیرەک دانەرو بە تەوسەوە قسەکەر.

-smart-alecky *(adj.)*.

**smarten** (smär′t'n), *v.t.* (١) پۆشتەوپەرداخ کردن؛ تەڕپۆش کردن.
(٢) خێراکردن؛ پێ هەڵگرتن؛ خێراتر ڕۆیشتن: *( ~ the pace)* .

*v.i.* ( ~ **up** ), خۆ پۆشتەوپەرداخ کردن.

**smart money,** (١) پارەی پێدراو لە بریتی برینداربوون یا نەخۆش کەوتن لە کاتی ئیشدا؛ بۆ بژاردنی نەخۆشی یا برینداربوونی کاتی کار.
(٢) زیادە بۆ بژاردنێکی وەها (لە سزای بێ دەربەستیدا).
(٣) پارەی گرەو لەسەر گراوی کەسێك کە زۆربەی کات براوەیە.

**smart set,** خەڵکی تێکەیشتوو زیرەك و تەڕپۆش.

**smart-weed** (smärt′wēd´), *n.* ڕووەکێکی زەلکاوی گوڵ ڕەنگاوڕەنگە گەڵاکەی تامی توون و تیژە.

**smarty, smartie** (smär′ti), *n.* = smart aleck.

**smash** (smash), *v.t.* (١) ووردوخاش کردن؛ شکاندن؛ هەپروون بە هەپروون کردن.
(٢) پیاماڵین؛ بە توند پیادان؛ هاویشتن؛ بە توند لێدان یا پیاکێشان:
*( ~ed his fist on the table.)*
(٣) بە توند لێدانی تۆپی تەنس بەسەر سەرداو کێشانی بە زەویدا.
(٤) هارین؛ جیق دەرهێنان؛ پان وپلیش کردنەوە؛ پلیشاندنەوە؛ بەزاندن؛ تێکشکاندن؛ ڕاڤراندن.

*v.i.* (١) بە قایم بۆپێشەوەچوون؛ بە توندو بە دەنگی بەرز بەرەوپێشەوەچوون.
(٢) ووردوخاش بوون؛ هەپروون بە هەپروون بوون؛ شکان؛ پارچە پارچە بوون.
(٣) بە توند لێدانی تۆپی تەنس بەسەر سەرداو کێشانی بەزەویدا.
(٤) پلیشانەوە؛ جیق دەرهاتن؛ پان وپلیش بوونەوە؛ تێکشکان.
(٥) ( ~ **up** ) نابووت بوون؛ مایە پووت بوون.

*n.* (١) (ا) دەنگی ووردو خاش بوون؛ هارە؛ شەقە؛ تەقە.
(ب) ووردوخاش بوون؛ ووردوخاشی؛ ووردوخاش کران.
(٢) تێکشکان؛ بەزین؛ فەوتان؛ شکستی.
(٣) ژێرکەوتن؛ نابووتی؛ مایەپووتی.
(٤) بەیەکدادان بە دەنگی بەرزو بە توند؛ تەپە؛ دەنگی پیاکێشان؛ پیاکێشان.
(٥) خواردنەوەیەکی مەستکەرە (لە براندی و نەعنا و شەکر درووست دەکرێ).
(٦) بە توند لێدانێکی تۆپی تەنس بەسەر سەرداو کێشانی بەزەویدا.
(٧) [Colloq.]، زۆر سەرکەوتوو.

*adj.* [Colloq.], زۆر سەرکەوتوو.

*adv.* بە شەقە یا تەقەیەکی زل؛ بە تەپەیەکی زل.

**smashed** (smash′t), *adj.* [Slang], سەرخۆش؛ مەست؛ کەیل.

**smashing** (smash′iŋ), *adj.* (١) تەواو بەزێن؛ ووردوخاشانە؛ تەواو:
*( a ~ defeat)*
(٢) دەنگدەرەوە؛ زۆر جوان و سەرکەوتوو:
*( The play was a ~ success.; a ~ performance)*

**smash-up** (smash′up´), *n.* (١) ڕووخانی تەواو؛ بەزین؛ تێکشکان؛ هەرەس بردن؛ بەناخداچوون. (٢) کارەسات؛ شکستی.
(٣) لێکدانی زۆر بە قایمی دوو ئوتومبێل و شکانیان.

**smatter** (smat′ẽr), *v.t.* (١) دووان بە زمانێك بە ناتەواوی؛ قسەکردن بە زمانێك بە نارەوانی. (٢) بە لامسەرلایی فێربوونی شتێك؛ هەر بە ناو یا بە ڕووکەشی فێربوون؛ بە گاڵتەگرتنی فێربوونێك.

*v.i.* چەنەبازی کردن؛ چەنەدان؛ هەڵەوەڕی کردن.

*n.* زانینێکی کەم یا لامسەرلایی؛ زانینی ناتەواو یا ڕووکەشی.

**smattering** (smat′ẽr-iŋ), *n.* زانینێکی کەم یا لامسەرلایی؛ زانینی ناتەواو یا ڕووکەشی.

**smear** (smêr), *v.t.* (١) لەکەدارکردن؛ لەکاوی کردن؛ پیس کردن.
(٢) شتێکی لینج؛ چەور؛ یا پیس لێدان و بەسەردا بڵاوکردنەوە.
(٣) ناو لەکەدارکردن؛ ناوزڕاندن؛ ناو پیس کردن؛ ناو سووك کردن.
(٤) [Slang]، فەوتاندن؛ تێکشکاندن؛ نەهێشتن؛ سڕینەوە؛ لەناودان؛ بەرگرتن.

*v.i.* پیس بوون؛ لەکەداربوون؛ لەکاوی بوون.

*n.* (١) لەکە؛ پەڵە.
(٢) دڵۆپی شلە (وەك خوێن) کە دەخرێتە ژێر گەردبینەوە بۆ تێڕوانین.
(٣) ناوزڕان؛ ناو لەکەدارکردن؛ ناو پیس بوون؛ بوختان.
(٤) (ا) [Obs.]، مەلحەم.
(ب) ماددەیەکە کە لە ڕووەك دەدرێ یا بڵاودەکرێتەوە بەسەریدا.

**smear-case** (smêr′kās´), *n.* = cottage cheese.

**smeary** (smêr′i), *adj.* (١) لەکاوی؛ پەڵەدار؛ لەکەدار.
(٢) پیسکەر؛ لەکەدارکەر.

-smeariness *(n.)*.

**smell** (smel), *v.t.* (١) بۆن کردن.
(٢) هەستپێکردن؛ بۆن کردن (مەجاز): *( They ~ed trouble and ran.)* .
(٣) بۆن پێوەکردن؛ بۆن کردن (بۆئەوەی بزانرێ بۆگەنە یان نا):
*( ~ the milk and tell me if it's sour.)*

*v.i.* (١) بۆن پێوەکردن؛ بۆن کردن.
(٢) بۆن هاتن؛ بۆنێکی تایبەتی لێ هاتن: *( The bread ~s fresh.)*
(٣) بۆگەن لێوەهاتن؛ بۆن هاتن؛ بۆگەن کردن؛ بۆنی پیس لێوەهاتن.
(٤) ( ~ **of** ) (ا) بۆن لێ هاتن: *( His breeth ~s of garlic.)*
(ب) بۆنی خراپ لێوەهاتن (مەجاز)؛ ناپاکی و ناپەسەندی گەیاندن:
*( His plan ~s of treachery.)*
(٥) [Slang]، بایەخ نەبوون؛ هیچ تیا بەستە نەبوون؛ بەکەڵك نەهاتن.

*n.* (١) هەستی بۆن کردن (٢) بۆن؛ بۆن وبەرامە. (٣) بۆن کردن.
(٤) نیشانە؛ بۆن (مەجاز)؛ ڕا گەیاندن.

smell out, (١) بە بۆن دۆزینەوە؛ دۆزینەوە بە بۆن کردن.
(٢) بۆ گەڕان بە ووردی و دۆزینەوە.

**smeller** (smel′ẽr), *n.* (١) مرۆڤ یا گیانداری بۆنکەر؛ بۆنکەر.
(٢) شتی بۆندار؛ شتی بۆگەن. (٣) کەسێکە ئیشی ئەوەیە تام و چاك و خراپی شت تاقی بکاتەوە بە بۆن کردنی شتەکە. (٤) ئەندامی هەستیار؛ شاخی هەستیاری جانەوەر. (٥) [Slang]، لووت.

**smelling bottle,** شووشەی نەوشادر (ووشەی دوایی ببینە).

**smelling salts,** خوێی بۆن کردن؛ نەوشادری بۆنی خۆش پێوەکراوە بۆ هێنانەوە هۆش خۆی خەڵکی بووراوەو چاکردنەوەی سەر ئێشە.

**smelly** (smel′i), *adj.* بۆگەن؛ بۆندار.

**smelt** (smelt), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی بچووکی ڕەنگ زیوی‌یە.

**smelt** (smelt), *v.t.* تواندنەوەی کانزای خاوو پوختەکردنی.

*v.i.* توانەوەو پوختەکرانی کانزای خاو.

**smelt** (smelt), *alternative past tense and p.p. of* **smell.**

**smelter** (smel′tẽr), *n.* (١) توێنەرەوەی کانزای خاو (مرۆڤ).
(٢) کوورە یا کارگەی تواندنەوەو پوختەکردنی کانزای خاو.

**smeltery** (smel′tẽr-i), *n.* کارگەی تواندنەوەو پوختەکردنی کانزای خاو.

**smew** (smū), *n.* جۆرە مراوی‌یەکە.

**smidgen** (smij′in), *n. Also* smidgeon, smidgin, [Colloq.], تۆزێك؛ نەختاڵێك؛ نەختێك.

**smilax** (smī′laks), *n.* جۆرە ڕووەکێکی خۆهەڵواسەرە.

**smile** (smīl), *v.i.* (١) زەردەخەنەگرتن؛ خەنین؛ خەنینەوە؛ بسکەهاتن؛ بزەهاتن. (٢) بە سەیر هاتنەبەرچاو؛ بزەگرتن.
(٣) (ا) جوان دیار بوون؛ خەنینەوە (مەجاز):
*( hillsides ~ing in the sunlight)*
(ب) بۆ پێکەنین (مەجاز)؛ بە چاوێکی باش سەیرکردن؛ بەهات بوون؛ پەسەندکردن: *( Fortune ~d on us.)* .

*v.t.* (١) بە زەردەخەنە دەربڕین. (٢) گۆڕین یا کارتێکردن بە زەردەخەنە.

*n.* (١) زەردەخەنە؛ بسکە؛ بزە؛ خەنین؛ خەنینەوە.
(٢) زەردەخەنەگرتن؛ بسکەهاتن؛ خەنینەوە.
(٣) ڕوخسارێکی جوان یا دڵگیر؛ باری جوان و گەش.

-smiler *(n.)*; smilingly *(adv.)*.

smile away, بە زەردەخەنە لابردن؛ بە خەنین نەهێشتن یا سڕینەوە:

*( to smile away grief, tears, anger, etc.)*
**smile on (or upon),** بەچاوی ناش سەیرکردن؛ بەهات بوون بۆ:
*( Fortune smiled on her.)*
**smirch** (smũrch), *v.t.* (١) لەکەدارکردن؛ پیس کردن؛ لەکاوی کردن.
(٢) ناو لەکەدارکردن؛ ناو پیس کردن؛ ناوزڕاندن.
***n.*** (١) لەکە، پەڵە، پەڵەی پیس. (٢) لەکە (ناوبانگ)؛ لەکەداری.
**smirk** (smũrk), *v.i.* بزەهاتن، زەردەخەنە گرتن بەتەوسەوە، بە درۆوە، یا بە لەخۆبایی بوونەوە
***n.*** بزە؛ زەردەخەنەی بەتەوسەوە، بە درۆوە، یا بە لەخۆبایی بوونەوە.
**smirky** (smũrk'i), ***adj.*** بە بزەوە؛ بە زەردەخەنەی بەتەوس یا درۆوە:
*( a ~ face)*
**smite** (smīt), *v.t.* (١) (ا) بە توند لێدان؛ بە قایم پیاکێشان یا پیاماڵین (بە تیغ یا بە دەس).
(ب) لێدان (بە جۆرێکی تایبەتی): *( The Lord will ~ him dead.)* .
(٢) تووش بوون *( ~ with disease)* .
(٣) کوشتن؛ فەوتاندن؛ سزادان؛ تێکشکان؛ هێرش بردنەسەر.
(٤) کارتێکردن، لە پڕ هەست جووڵاندن.
(٥) دڵفڕاندن؛ کەوتنە خۆشەویستییەوە:
*( She has smitten him with her charms.; ~ with love)*
***v.i.*** لێدان بە قایم؛ بە توند پیاکێشان یا پیاماڵین.
**smith** (smith), ***n.*** (١) ئاسنکوت؛ ئاسنگەر؛ زەڕەنگەر:
*(gold ~ ; silver ~)*
(٢) **blacksmith**.
**smithereens** (smi*th*'ə-rēnz´), ***n.pl.*** [Colloq.], وردە پارچە
**smithers** (smi*th*'ẽrz), ***n. pl.*** [Colloq.], = **smithereens.**
**smithery** (smith'ẽr-i), ***n.*** (١) زەڕەنگەری؛ ئاسنگەری؛ ئاسنکاری.
(٢) **smithy**
**smithsonite** (smith'sən-īt´), ***n.*** سمیسۆنیت، کانزایەکی سپی یا زەردکاری چینکۆیییە.
**smithy** (smith'i), ***n.*** دووکانی ئاسنگەر؛ ئاسنگەرخانە؛ دووکانی ئاسنگەری.
**smitten** (smit'ʼn), *alternative p.p. of* **smite.**
***adj.*** (١) بە قایم لێدراو؛ بە توند پیاکێشراو.
(٢) تووش بوو؛ شکست؛ پێوەبوو؛ زۆر خراپ تێکەوتوو.
(٣) [Colloq.]، زۆر کەوتۆتە خۆشەویستی کەسێکەوە؛ زۆر لە دڵداریدایە؛ دڵفڕێنراو
**smock** (smok), ***n*** (١) بەرگێکی تەنک و نەختێک دەڵبی دەرەوەیە لەسەر لەسەر جلەوە لەبەر دەکرێ لەکاتی ئیش کردندا بۆ پیس نەبوونی جلەکان.
(٢) [Archaic]، **chemise** .
***v.t.*** (١) ئەم جۆرە بەرگە لەبەرکردن.
(٢) لۆچ کردن و تێککردنی جل و بەرگ بە ڕیز بۆ جوانی.
**smock frock,** بەرگێکی سەر جلە کرێکاری ئەورووپایی لەبەری دەکەن (ووشەی پێشوو ببینە).
**smocking** (smok'iŋ), ***n.*** لۆچ کردن و تێککردنی جل و بەرگ بە ڕیز بۆ جوانی.
**smog** (smog), ***n.*** دووکەڵی ئوتومبیل و کارگە؛ دووکەڵی پیس.
**smoggy** (smog'i), ***adj.*** دووکەڵاوی؛ پڕە لە دووکەڵی ئوتومبیل و کارگە.
**smoke** (smōk), ***n.*** (١) دووکەڵ
(٢) شتێکی دووکەڵ ئاسا (وەك هەڵم و هاڵاو).
(٣) جگەرە کێشان؛ ماوەی جگەرە کێشانێك:
*( Do we have time for a ~ ? )*
(٤) جگەرە؛ سەبیل.
(٥) شتێکی بێ سوود یا بێ ئەنجام: *( Our plans went up in ~ .)* .
(٦) شتی لێڵکەر.
***v.i.*** (١) دووکەڵ کردن؛ دووکەڵ لێوەهاتن
(٢) دووکەڵ کردن بەشێوەیەکی خراپ (زۆپا، ئاگردان):
*( The firepalce ~s badly.)*
(٣) دووکەڵ زۆر کردن (چرا). (٤) تەپ و تۆز لێ هەڵساندن (بە خێرا ڕۆیشتن).
(٥) جگەرەکێشان؛ جگەرە خواردن.
***v.t.*** (١) لەکەدارکردن بە دووکەڵ؛ دووکەڵاوی کردن؛ ڕەش کردن.
(٢) دووکەڵ کردن (گۆشت، ماسی)؛ بە دووکەڵ ئامادەکردن و پاراستن (وەك قاورمە). (٣) قانگدان؛ قاودان؛ دەرپەڕاندن.
(٤) جگەرەکێشان؛ جگەرە خواردن.
(٥) [Archaic]، هەستپێکردن؛ دەرك پێکردن:
*( He ~ed the trick at once.)*
(٦) [Obs.]، گاڵتەپێکردن؛ کلك پێوەکردن.
smoke out, قانگدان؛ قاودان؛ دەرپەڕاندن.
**smoke bomb,** بۆمبای دووکەڵ (جەنگ).
**smoke-house** (smōk'hous´), ***n.*** کارگەی گۆشت و ماسی دووکەڵ کردن؛ دووکەڵخانە.
**smoke-jack** (smōk'jak´), ***n.*** ئامێری سووڕانەوەی شیشی گۆشت برژاندنی کوورە.
**smoke-jumper,** ئاگرکوژێنەرەوەیەکە کە بە پەڕەشووت دێتە خوارەوە بۆ کوژاندنەوەی ئاگری دارستان.
**smokeless** (smōk'lis), ***adj.*** بێ دووکەڵ؛ دووکەڵ نەکەر.
**smokeless powder,** بارووتی بێ دووکەڵ.
**smoker** (smōk'ẽr), ***n.*** (١) جگەرەکێش؛ جگەرەخۆر.
(٢) فارگۆنی جگەرەکێشان لە شەمەندەفەردا.
(پێشی دەوترێ: " **smoking car** ").
(٣) ئاهەنگ یا کۆڕی پیاوان (چونکە لە کۆندا جوان نەبوو لەبەرچاوی ئافرەت جگەرە بکێشرێ).
**smoke screen,** پەردە دووکەڵ (بۆ شاردنەوەی ڕاستییەك، نهێنییەك، یا جم و جووڵی لەشکرێك لە دوژمن)؛ چاوبەست.
**smokestack** (smōk'stak´), ***n.*** دووکەڵکێش.
**smoke tree,** درەختێکە گوڵە پەڕدارەکانی لە دووکەڵ دەچێ.
**smoking car,** فارگۆنی جگەرەکێشانی شەمەندەفەر.
(هەروەها " **smoker** ").
**smoking jacket,** چاکەتی جگەرەکێشانی پیاوانە: چاکەتێکی نەختێك دەڵبی ئێوارانی پیاوانەیە جاران پیاو لەبەری دەکرد لە ماڵەوە لە کاتی جگەرەکێشاندا بۆ پاراستنی جلەکانی لە بۆنی دووکەڵ.
**smoking room,** ژووری جگەرەکێشان (لە ئوتێل و یانەدا).
**smoking-room** (smōk'iŋ-rōōm), ***adj.*** بێ پەردە (قسە، نوکتە، چیرۆك)؛ هەڵماڵراو.
**smoky** (smōk'i), ***adj.*** (١) زۆر دووکەڵکەر:
*( a ~ fire, fireplace, etc.)*
(٢) لە دووکەڵ دەچێ؛ دووکەڵی: *( a ~ haze)* .
(٣) دووکەڵاوی؛ پڕە لە دووکەڵ: *( a ~ room)* .
(٤) دووکەڵاوی؛ ڕەنگ و تام و بۆنی لە دووکەڵ دەچێ.
(٥) دووکەڵ ڕەشی کردووە؛ دووکەڵ لێی داوە یا پیسی کردووە.
-**smokily** *(adv.)*; **smokiness** *(n.).*
**smolder** (smōl'dẽr), ***v.i.*** *Also* **smoulder,** (١) سووتان و دووکەڵ کردن بەبێ گڕ لێبوونەوە. (٢) خەفەبوون؛ بە خەفەیی مانەوە.
(٣) پێش خواردنەوە؛ لە ژێرەوە تووڕەبوون و ڕق لێ بوونەوە:
*( For years hatred ~ed in his heart.)*
***n.*** چڕە دووکەڵی ئاگری بێ گڕ؛ ئاگری خەفەکراو.
**smolt** (smōlt), ***n.*** بەچکە ماسی " سەلموون".
**smooch** (smōōch), ***v.t. & n.*** = **smudge.**
**smooch** (smōōch), ***v.i.*** [Slang], ماچ کردن.
***n.*** [Slang], ماچ.
**smooth** (smōōth), ***adj.*** (١) (ا) ساف و لووس: *(a ~ suface)* .

(ب) سوو؛ ساف. ( a ~ tire) .
(٢) تەخت. (٣) بێ تووك؛ لووس‌وپووس؛ لووس: ( a ~ cheek) .
(٤) شل؛ یەك دان (توندوتۆڵی شلە)؛ بە تۆپەڵ نەوەستاوە: ( a ~ paste) .
(٥) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ مەنگ. ( a ~ seas) .
(٦) ئاسان؛ بێ تەنگوچەڵەمە؛ بێ ناڕەحەتی؛ ڕێكوپێك:
( ~ progress; ~ sailing)
(٧) لەسەرخۆ؛ هێمن: ( a ~ temper)
(٨) خۆش (تام)؛ توون و تیژ نییە.
(٩) ساز (دەنگ)؛ خۆش؛ یەك نەوا.
(١٠) زمان لووس؛ خۆ بەرە پێشەوە؛ ڕێكوپێك (ڕەووشت):
( ~ words; a ~ manner; a ~ talker)
(١١) [Slang]؛ زۆر خۆش (كات): ( a ~ time) .
(١٢) [Slang]، لێهاتوو؛ ڕێكوپێك؛ جوان و باش: ( a ~ dancer) .
(١٣) لەبەك ناكەوێ (مەكینەكاری).

*v.t.* (١) تەخت كردن. (٢) (أ) ساف‌ولووس كردن؛ ساف كردن. (ب) چرچ‌ولۆچ تێدا نەهێشتن یا لێ لابردن. (٣) ئاسان كردن؛ كەندو كۆسپ لەبەردەم لادان. (٤) هێمن كردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ. (٥) جوان و ڕێكوپێك.

***adv.*** بە ئاسایی و ڕێكوپێكی؛ بە هێمنی؛ لەسەرخۆ.

***n.*** (١) شتێكی ساف‌ولووس؛ ڕووبەكی ساف‌ولووس یا تەخت.
(٢) ساف‌ولووسكاری؛ تەخت كردن.

**smooth away,** ئاسان كردن؛ كەندو كۆسپ لە ڕێدا لابردن:
*( to smooth away obstacles to a plan)*

**smooth down,** هێمن كردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ.

**smooth over,** چاو لێ پۆشین؛ زۆر بە گرنگ دانەنان؛ زۆر گوێ پێ نەدان.

**smoothbore** (smōō*th*′bôr′, smōō*th*′bōr′), ***adj.*** لوولە ساف (تفەنگ).
***n.*** تفەنگی لوولە ساف.

**smoothen** (smōō*th*′'n), ***v.t.*** ساف‌ولووس كردن
***v.i.*** ساف‌ولووس بوون

**smooth-faced** (smōō*th*′fāst′), ***adj.*** (١) دەموچاو لووس؛ بێ ڕیش و سمێڵ؛ تیف تیفەدراو. (٢) ساف‌ولووس: ( a ~ tile) .
(٣) ڕووانەتیاز؛ دڕۆزنە؛ بە سەرزاری دڵسۆز

**smooth muscle,** ماسوولكەی لەخۆوە كاركردوو یا ئۆتۆماتیكی (وەك ماسوولكەی ڕیخۆڵەو میزەڵدان و دەزوولە خوێن).

**smooth-shaven** (smōō*th*′shāv′'n), ***adj.*** خۆ تیف تیفەكردوو؛ دەموچاو پەرداخ كردوو؛ ڕیش جوان تاشیو.

**smooth-spoken** (smōō*th*′spō′k'n), ***adj.*** قسەخۆش؛ زمان لووس؛ زمانپاراو؛ قسەزان.

**smooth-tongued** (smōō*th*′tuŋd′), ***adj.*** زمان لووس؛ دەم لووس.

**smorgasbord** (smūr′gəs-bōrd′), ***n.*** خوانی جۆراوجۆری یەك نرخ. چێشتخانەیەكە خواردەمەنی هەمەچەشنی لەسەر خوان تێدا دادەنرێ و هەركەس چەندی پێ بخورێ دەیخوات بە یەك نرخ و بەردەستی خۆیشی دەكات.

**smote** (smōt), *alternativ past tense and p.p. of* smite.

**smother** (smu*th*′ēr), ***v.t.*** (١) (أ) هەناسە لێ برین. (ب) خنكاندن.
(٢) ئاگر خەفەكردن. (٣) داپۆشین؛ بەسەردا بڵاوكردنەوە:
*( a dish of liver ~ed in onions; a grave ~ed in flowers; to ~ a child with kisses)*
(٤) شاردنەوە؛ كردن بە ژێرەوە: ( to ~ a yawn, one's anger, etc.) .
***v.i.*** (١) هەناسە بۆ نەدران؛ خنكان؛ هەناسە لێ بڕان.
(٢) شاردنەوە؛ بەژێرەوە كران؛ كپ كرانەوە
(٣) [Dial.] سووتان و دووكەڵ كردن بە بێ گڕ لێبوونەوە.
***n.*** (١) چڕە دووكەڵ؛ تەپ و تۆز یا هەڵمی چڕ
(٢) [Archaic]، ئاگرێكە كە لە ژێرەوە بسووتێ و دووكەڵ بكات بەبێ گڕ لێبوونەوە؛ ئاگری خەفەكراو. (٣) لە ژێرەوە كوڵان؛ پێشان؛ پێش خواردنەوە.
(٤) پشێوی؛ تێكەڵ‌وپێكەڵی.
-smothery *(adj.)*.

**smoulder** (smōl′dēr), ***n.*** = smolder.

**smudge** (smuj), ***n.*** (١) لەكە؛ پەڵە. (٢) ئاگری چڕە دووكەڵاوی.
(٣) چڕە دووكەڵ (بۆ ئاگدانی مێشوولەو جانەوەری تر یا داروبەرەخت پاراستن لە زوقم و سەرما).
***v.t.*** (١) ئاگدانی جانەوەر بە چڕە دووكەڵ؛ چڕە دووكەڵ كردن بە باخدا بۆ پاراستنی لە زوقم و سەرماوسۆڵە. (٢) لەكەداركردن (وەك لاپەڕەیەك بە مەرەكەبی لاپەڕەیەكی تری تازە نووسراو یا چاپكراو)؛ پیس كردن.
***v.i.*** (١) بڵاوبوونەوەی لەكەیەك. (٢) لەكەداربوون؛ پیس بوون؛ لەكاوی بوون.

**smudgy** (smuj′i), ***adj.*** لەكەدار (وەك بە مەرەكەب)؛ پیس؛ لەكاوی.
-smudgily *(adv.)*; smudginess *(n.)*.

**smug** (smug), ***adj.*** (١) جوان و ڕێكوپێك؛ شۆخ؛ تەڕپۆش.
(٢) زۆر لەخۆ ڕازی؛ هەست بە هیچ پێویستیی و مەترسیی و كەم‌وكووڕییەك نەكەر.
-smugly *(adv.)*; smugness *(n.)*.

**smuggle** (smug′'l), ***v.t.*** (١) بە قاچاخ هێنان و بردن:
[ to ~ goods into (*or* out of) the country ]
(٢) بە دزییەوە بردن یا دەركردن: *( to ~ a letter out of prison)*
***v.i.*** قاچاخچێتی كردن

**smuggler** (smug′lēr), ***n.*** (١) قاچاخچی. (٢) كەشتی قاچاخچێتی.

**smut** (smut), ***n.*** (١) هێبس (٢) لەكە؛ پەڵە
(٣) قسە یا نووسینی پیس و ناشرین؛ نووسراوی بێ شەرمانەو نزم و پیس
(٤) سن (كە لە دەغڵ‌ودان دەدات و ڕەشی دەكات).
***v.t.*** پیس كردن؛ لەكاوی كردن؛ لەكەداركردن.
***v.i.*** پیس بوون؛ لەكاوی بوون
-smuttily *(adv.)*; smuttiness *(n.)*; smutty *(adj.)*.

**smutch** (smuch), ***v.t.*** لەكاوی كردن؛ پیس كردن؛ لەكەداركردن.
***n.*** (١) لەكە؛ پەڵەی پیس؛ پەڵە. (٢) چڵك و پیسی ووشك بووەوە؛ بەڵغ.
-smutchy *(adj.)*.

**snack** (snak), ***n.*** (١) بەش. (٢) ئاوگیر؛ ئەو خواردەمەنییەیە كە لە بەینی دوو ژەمدا دەخورێ بە سەرپێیییەوە
***v.i.*** ئاوگیركردن؛ نەختێك شت خواردن بە سەرپێیییەوە لە بەینی دوو ژەمدا.

**snack-bar** (snak-bar), ***n.*** چێشتخانەیەكە خواردنی سووكی سەرپێیی پێشكەش دەكات.

**snaffle** (snaf′'l), ***n.*** لغاو.
***v.t.*** لغاوكردن.

**snafu** (sna-fōō′, snaf′ōō), ***adj.*** [Military Slang], بە تەواوی شێواو؛ زۆر شێواو یا تێكچوو.
***v.t.*** [Military Slang], شێواندن؛ بەتەواوی تێكدان یا شێواندن.
***n.*** [Military Slang], بارێكی بەتەواوی شێواو یا تێكچوو.

**snag** (snag), ***n.*** (١) چوقوڵ؛ چوقوڵی لقی بڕاوە؛ كۆڵكەداری تیژ.
(٢) كۆتەرەدار یا لقەداری ژێرئاوی ڕووبارو دەریاچە (كە دەبێتە هۆی مەترسی بۆ بەلەم پێدا ڕۆیشتن) (٣) snaggle tooth .
(٤) دڕان یا هەڵوەشانەوەی كاڵا.
(٥) تەگەرە؛ قۆرت یا كۆسپی چاوەڕوان نەكراو: *( Our plan hit a ~. )*
***v.t.*** (١) چوقوڵ لێدان؛ دڕان یا هەڵوەشانەوە بە چوقوڵ بەركەوتن.
(٢) تەگەرە تێخستن؛ تەگەرە تێكەوتن؛ قۆرت خستنەڕێ.
(٣) ڕووبار یا دەریاچە پاكردنەوە لە كۆتەرەدارو لقەدار.
-snaggy *(adj.)*.

**snaggle-tooth** (snag′'l-tōōth′), ***n.*** (١) ددانی دەرپۆقیو.
(٢) ددانی خوار یا شكاو
-snaggletoothed *(adj.)*.

**snail** (snāl), ***n.*** (١) شەیتانۆكەی باخچە؛ قاقلەجنۆكە؛ گیاندارێكی نەرمی لینجی قاقلەدارە گژوگیاو ڕووەكی باخچە دەخوات؛

پێچ پێچۆکە (٢) کەسێك یا گیاندارێکی زۆر خاوو خلیچك یا هێواش؛ کەسێکی خاو یا تەمەڵ

**at a snail's pace,** زۆر بە هێواشی؛ زۆر خاو یا هێواش

**snail-paced** (snāl'pāst´), *adj.* زۆر هێواش؛ زۆر خاو:
*( ~ progress)*

**snake** (snāk), *n.* (١) مار. (٢) کەسێکی ناپاك و نهێنگر
(٣) تەڵێکی ئەستوورو زۆر درێژە دەکرێ بەناو بۆری و زێرابی گیراودا بۆ بەرەڵاکردنی
*v.i.* بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن وەك مار؛ وەك مار کشان یا خشان
*v.t.* [Colloq.]. (١) ڕاکێشان (بەتایبەتی بە پەت یا زنجیر). (٢) ڕاتەکاندن
(٣) وەك مار بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ کشان وەك مار.

**snake-bird** (snāk'bûrd´), *n.* مارە مەل: مەلێکی دەریایی ماسی خۆری مل پێچاوپێچ و درێژو دەنووك تیژو درێژی ناوچە گەرمەکانە.

**snake-bite** (snāk'bīt´), *n.* مار پێوەدان؛ مار گەستن؛ گازە مار.

**snake charmer,** مارگر مارباز.

**snake dance,** مارە سەما: (ا) جۆرە سەمایەکی دوو ساڵانەی تیرەی " هۆپی " هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکانە بریتی‌یە لە یاری کردن بە ماری زەنگوڵەدار لەکاتی سەماکەدا (ب) خۆپیشاندانێکە خەڵك دەستی یەکتری تێدا دەگرن و پێچاوپێچ وەك مار دەڕۆن

**snake fence,** = worm fence.

**snake-head** (snāk'hed´). *n.* = turtlehead.

**snake in the grass,** دوژمنی نهێنی؛ برادەری ناپاك؛ مەترسی نەبینراو

**snake-mouth** (snāk'mouth´), *n.* دەمەمارانە: ڕووەکێکی گوڵ پەمەیی گەڵا نێزەیی‌یە.

**snake pit,** شێتخانە

**snake-root** (snāk'rōōt´, snāk'root´), *n.* (١) گیامارانە: ڕووەکێکە گوایە ڕەگەکەی دەرمانە بۆ مار پێوەدان. (٢) ڕەگی ئەم ڕووەکە.

**snake-skin** (snāk'skin´), *n.* (١) پێستە مار.
(٢) چەرم و قایشی لە پێستە مار دروستکراو

**snake-stone** (snāk'stōn´), *n.* (١) بەردە مارانە: بەردێکە گوایە دەرمانە بۆ مار گەستن. (٢) **whetstone**

**snake-weed** (snāk'wēd´), *n.* مارەگیا: چەند جۆرە ڕووەکێکە گوایە دەرمانن بۆ مار گەستن.

**snaky** (snāk'i), *adj.* (١) ماری؛ مارین؛ تایبەتی بە مار.
(٢) پێچاوپێچ. (٣) ناپاك؛ نهێنگر؛ ژەهراوی؛ پیس؛ نهێنباز.
(٤) ماراوی؛ پڕە لە مار.

**snap** (snap), *v.i.* (١) قەپ پێداکردن؛ قەپاڵ لێدان؛ قەپ لێدان:
*( The animal ~ped at the meat.)*
(٢) ( ~ at ) پڕ پێداکردن؛ قۆستنەوە؛ بە پەرۆشەوە وەرگرتن یا پەلاماردان:
*( We ~ped at the invitation.)*
(٣) ( ~ at ) بە ناشرینی و توندوتیژی وەڵام دانەوە یا قسە لەگەڵ کردن.
(٤) لە پڕ قرتان یا پچڕان بە دەنگێکی بەرز؛ لە پڕ ترازان؛ لێك ترازان.
(٥) ڕووخان (هەستە دەمار، مێشك، بەرهەڵستی)؛ پسان؛ هەرەس بردن.
(٦) قرچەقرچ کردن (داری ناو ئاگر)؛ تەقەتەق هاتن؛ تەقینەوە؛ شەقە لێ هەڵسان؛ قرتەکردن.
*( The fire is ~ping.; The whip ~ped loudly.)*
(٧) قرتە لێ هەڵسان لەکاتی داخستندا؛ تەقە لێوەهاتن:
*( The lock ~ped shut.)*
(٨) بە خێراو ڕێك و پێکی جووڵانەوە:
*( The soldiers ~ped to attention.)*
(٩) کرانەوەو داخران خێرا خێرا (وەك چاو لەکاتی شڵەژان و پەشۆکاندا).
*v.t.* (١) پڕ پێداکردن؛ پەلاماردان؛ قەپ پێداکردن؛ قۆستنەوە.
(٢) قرتاندن؛ لێك ترازاندن بە دەنگی بەرز؛ پچڕاندن و قرتە لێ هەڵساندن.
(٣) ( ~ out ) پێ وەڕین (مەجاز)؛ بە ناشرینی و توندوتیژی قسە لەگەڵ کردن.
(٤) چەقەنەلێدان؛ بستەلێدان: *( He ~ped his fingers.)*
(٥) قرتە لێ هەڵساندن لەکاتی داخستندا؛ داخستن بە قرتە:
*( He ~ped the safety before putting the gun away.)*
(٦) تێگرتن (وەك دارو لاستیك):
*( He ~ped her with a rubber band.)*
(٧) وێنەگرتن: *( She ~ped a picture for us.)* .
*n.* (١) قەپ؛ قەپاڵ. (٢) پڕ پێداکردن؛ قۆستنەوە؛ قۆزینەوە؛ پەلامار.
(٣) قرتان؛ پچڕان بە دەنگی بەرز؛ لێك ترازان و قرتەکردن.
(٤) شەقە؛ قرتە؛ قرچە: *( We heard the ~ of the whip.; the ~ of a broken branch in the forest)*
(٥) وەڕە (مەجاز)؛ وەڵام یا قسەی ناشرین؛ حەپە (مەجاز).
(٦) ماوەیەکی کورت (تەنها بۆ سەرماوسۆڵە):
*( We had a cold ~ last month.)*
(٧) قرتێنە: *( the ~ of a bracelet)* .
(٨) چەقەنە؛ بستە. (٩) داخستنێکە کە قرتەی لێوەبێت (وەك هی قفڵ).
(١٠) بسکویتێکە زەنجەفیلی تێ دەکرێ. (هەروەها " gingersnap " )
(١١) **snapshot** .
(١٢) [Colloq.]، تین؛ چوست و چالاکی؛ گڤ وگوڕ؛ ووزە:
*( The performance seemed to have no ~ .)*
(١٣) [Slang]، شتێکی ئاسان؛ کارێکی ئاسان؛ کارێکی سووك.
(١٤) [Slang]، کەسێکی بە ئاسانی کارتێکراو یا شت پێ سەلمێنراو.
*adj.* (١) سەرپێیی (بڕیار)؛ بیری لێ نەکراوەتەوە؛ پەلە: *( a ~ decision)* .
(٢) قرتە لێ هەڵساو لەکاتی داخستندا.
(٣) [Slang]، ئاسان؛ سووك: *( a ~ assignment, job, etc.)*
*adv.* بە قرتە؛ بە قرتەوە؛ بە شەقە.

**not a snap,** بە هیچ جۆرێك؛ هیچ.

**snap ( a person's) head off,** سەرلێکردنەوە؛ زۆر بە تووڕەیی و توندوتیژی‌یەوە قسە لەگەڵ کردن؛ زۆر لێ تووڕە بوون.

**snap once's finger at,** بە سووك تەماشاکردن؛ بەهیچ دانان؛ گوێ پێ نەدان؛ ڕێز نەگرتن.

**snap out of it,** زوو هەڵسانەوە (لە نەخۆشی یا دڵتەنگی)؛ زوو خۆگرتنەوە یا هاتنەوە سەرخۆ؛ چاکبوونەوە؛ خۆ لێ ڕزگارکردن:
*( We hope he will snap out of his depression.)*

**snap bean,** لۆبیای سەوز.

**snap-brim** (snap'brim´), *n.* شەپقەیەکە لێوارەکەی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ سەرەوە لە پشتەوەو داکەوتووە بۆ خوارەوە لە پێشەوە.

**snap-dragon** (snap'drag´on), *n.* ڕووەکێکە گوڵی سپی و زەردو سوورو ئەرخەوانی دەگرێت.

**snapper** (snap'ēr), *n.* (١) بکەری " snap " .
(٢) **snapping turtle** . (٣) **snapping beetle** .

**snapping beetle,** قالۆنچەی تەقەتەقکەر: قالۆنچەیەکە کە دەستی تێوەدرا یا کەوت بەسەر پشتدا خۆی ڕادەتەکێنێ و تەقەتەقی لێوەدێت

**snapping turtle,** کیسەڵی ئاوی گازگر؛ کیسەڵێکی ئاوی‌یە کاژێری بەهێزە بە توند قەپ لە نێچیرەکەی دەگرێ.

**snappish** (snap'ish), *adj.* (١) گازگر (سەگ)؛ دڕ.
(٢) تووڕە؛ بێ نەزاکەت؛ زمان پیس؛ تووڕەوتڕۆ؛ بە کورتی و ناشرینانە وەڵام دەرەوە.

-snappishly *(adv.)*; snappishness *(n.)*.

**snappy** (snap'i), *adj.* (١) بەتین؛ گورج وگۆڵ؛ چوست وچالاك؛ خێرا: *( a ~ reply, coversation, pace, etc.)* .
(٢) **snappish** .
(٣) ساردو خۆش؛ ئەختێك سارد: *( a ~ day)* .
(٤) [Colloq.]، شۆخ، تەڕپۆش: *( a ~ dresser)* .

-snappily *(adv.)*; snappiness *(n.)*.

**make it snappy,** [Slang]. خێراکە؛ پەلەکە.

**snap-shot** (snap′shot´), *n.* (١) تەقەی بێ نیشان گرتنەوە.
(٢) وێنەی سەرپێیی (بە کامێرا). (٣) دیمەنێکی بە پەلە یا بۆ ماوەیەکی کورت بینراو؛ وێنەی ئەم دیمەنە لە مێشکدا.
**snare** (snâr), *n.* (١) تەڵە؛ داو؛ تەپکە
(٢) ژێیەکە دەورو بنی تەپڵی پێ دەگیرێ بۆ باشتر دەنگدانەوەی.
(٣) **snare drum**.
(٤) قوڵفەی تەلیکە بۆ دوومەڵ دەرهێنان (نەشتەرکاری).
*v.t.* کردن بە تەڵەوە؛ بە تەڵە گرتن؛ کردن بە داوەوە.
**snare drum,** تەپڵێکی بچووکی دووسەرییە دەورەکەی و بنەکەی بە ژێ دەگیرێ بۆ باشتر دەنگدانەوەی.
**snarl** (snärl), *v.i.* (١) مڕاندن؛ دان لێ جیڕکردنەوە (وەك سەگ)؛ مڕەمڕکردن. (٢) بە تووڕەیی و توندوتیژی و ناشرینی لەگەڵ دووان؛ وەك سەگ پێ وەڕین یا حەپەکردن (مەجاز): *( He ~ed at us.)*.
*v.t.* بە تووڕەیی و توندوتیژی و ناشرینی ووتن؛ وەك حەپە یا وەڕەی سەگ ووتن *( He ~ed his contempt.)*.
*n.* (١) مڕە؛ مڕەمڕ؛ ددان جیڕکردنەوە.
(٢) ووتەی توندوتیژو ناشرینی بە تووڕەیی ووتراو؛ وەڕە (مەجاز)؛ حەپە.
**snarl** (snärl), *v.t.* (١) ئاڵۆسکاندن (دەزوو، پەت، قژ، قولاپی ڕاوەماسی)؛ ئاڵۆزان؛ تێکئالان و گرێ تێخستن.
(٢) شێواندن؛ ئاڵۆزان؛ بەیەکداچوون و تێکئالان: *( Traffic is ~ed.)*.
*v.i.* ئاڵۆسکان؛ تێکئالان و گرێ تێکەوتن؛ بەیەکداچوون.
*n.* (١) ئاڵۆسکاوی؛ شتی تێکئالاو یا بەیەکداچوو و گرێ تێکەوتوو؛ گرێ کوێرە *( The child's hair is full of ~s.)*.
(٢) بارێکی ئاڵۆسکاو؛ ئاڵۆسکان و شێوانی کاروبار؛ ئاڵۆزی؛ تەنگوچەڵەمە.
**snarly** (snär′li), *adj.* تووڕەوترۆ؛ زمان پیس؛ بە خەڵك دەوەڕێ (مەجاز).
**snarly** (snär′li), *adj.* ئاڵۆزاو؛ ئاڵۆسکاو گرێ تێکەوتوو؛ ئاڵۆز؛ شێواو.
**snatch** (snach), *v.t.* (١) لە دەست هەڵپڕوسکاندن؛ لە دەست فڕاندن؛ پڕ پێداکردن و بردن؛ پەلاماردان و فڕاندن؛ لە دەست ڕاپسکان؛ قۆستنەوە:
*( He ~ed the purse from her hand in broad daylight.)*
(٢) بە هەل زانین و بردن یا کەڵك لێ وەرگرتن؛ هەل هێنان و کردن:
*( He ~ed a few hours of rest.)*
(٣) [Slang]، فڕاندن (مرۆڤ):
*( The kid was ~ed as he left school.)*
***v.i.* ( ~ at ),** پەلاماردان؛ پڕ پێداکردن؛ قۆستنەوە؛ هەوڵی گرتن یا بردن دان.
*n.* (١) پڕ پێداکردن؛ لە دەست هەڵپڕووسکان؛ لێ فڕاندن؛ پەلاماردان و بردن.
(٢) ماوەیەکی کورت؛ ماوەیەکی کەم: *( a ~ of sleep)*.
(٣) نەختێك؛ تۆزێك؛ تۆسکاڵ؛ کەمێك: *( ~es of gossip)*.
(٤) [Slang]، فڕاندن (مرۆڤ). (٥) [Slang]، قوز. کوز.
**snatch at,** (١) پڕ پێداکردن؛ پەلاماردان بۆ گرتن:
*( He snatched at the purse, the rope, etc.)*
(٢) بە پەرۆشەوە وەرگرتن یا پێ قایل بوون؛ قۆستنەوە؛ قۆزینەوە:
*( She snatched at the chance to go on a trip to Europe.)*
**snatch-block,** بەکرەیەکە کە دەتوانرێ لە لایەکیەوە بکرێتەوە بۆ هەڵکردن یا توندکردنەوەی گوریسی شل (کەشتییەوانی).
**snatchy** (snach′i), *adj.* پچڕپچڕ؛ نارێك وپێك؛ دەمدەمی.
**snath** (snath), *n. Also* snathe, دەسکە داس.
**snazzy** (snaz′i), *adj.* [Slang], زۆر جوان و نایاب؛ شۆخ (شت)؛ قۆز؛ کەشخە: *( a ~ dress, suit, jacket, pair of shoes)*.
**sneak** (snēk), *v.i.* (١) بە دزییەوە هاتن و چوون؛ بەبێ خشپە ڕۆیشتن، چوونەناو. یا چوونەدەرەوە: *( to ~ in or out of a place)*.
(٢) ترسنۆکی نواندن؛ بە نهێنی و ترسنۆکانە ڕەفتارکردن.
(٣) [Slang]، سووسەکردنی قوتابی بەسەر ئاوەڵەکانیەوە بۆ مامۆستا.
*v.t.* (١) بە دزییەوە پەڕاندنەوە یا بردن؛ بە قاچاخی بردن؛ بە نهێنی بردن یا دەربازکردن: *( He ~ed the jewels across the border.; She ~ed him into the country in the car trunk.)*
(٢) [Colloq.]، دزین.
*n.* (١) کەسێکی نهێنبازو ترسنۆك و ناڵەبار؛ ئاگری بن کا؛ قوماربازا.
(٢) جووڵانەوەیەکی بێ خشپە یا بە دزییەوە.
(٣) [Colloq.] (*pl.*)، **sneakers**.
(٤) [Slang]، قوتابی سووسەکەر بەسەر ئاوەڵەکانیەوە بۆ مامۆستا
*adj.* بە دزییەوە کراو یا پیلان بۆ کراو: *( a ~ attack )*.
**sneak out of,** خۆ لێ دزینەوە (ئەرکی سەرشان)؛ خۆ لە ئیش شاردنەوە؛ خۆ دەربازکردن.
**sneaker** (snēk′ēr), *n.* [Colloq.] (*pl.*), پێڵاوی لاستیك (کە بۆ یاری یا وەرزش لەپێ دەکرێ) (پێشی دەووترێ: " **tennis shoes** " )
**sneaking** (snēk′iŋ), *adj.* (١) ترسنۆکانە؛ بە دزییەوە؛ نهێنی (لەڕووی سووکییەوە). *( a ~ manner)*.
(٢) نهێنی؛ پێ لێ نەنراو؛ شاراوە: *( a ~ fondness for stealing)*.
(٣) بەرە بەرە لەزیادبووندایە.
**sneaking suspicion,** نەختێك گومان کە ووردە ووردە پەرە دەسێنێ.
**sneak preview,** پیشاندانێکی فیلمی سینەما بە دزییەوە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕای خەڵك پێش پیشاندانی گشتی بۆ هەمووکەس.
**sneaking thief,** دزێکە کە شت دەدزێ بێ ئەوەی دەرگاو پەنجەرە بشکێنێ بەڵکو بە چوونەژوورەوە لە دەرگاو پەنجەرەی کراوەوە؛ دزێکە کە بە دزییەوە شت دەدزێ نەك بە زۆر.
**sneaky** (snēk′i), *adj.* نهێنکر؛ قوماربازا؛ ترسنۆك و نهێنباز؛ ئاگری بن کا؛ بە دزییەوەو بە نامەردانە کراو.
-**sneakily** *(adv.)*; **sneakiness** *(n.)*.
**sneer** (snêr), *v.i.* (١) گاڵتەپێکردن؛ لاقرتێ پێکردن؛ قەشمەری پێ هاتن؛ لچ لێ هەڵقورتان. (٢) لاقرتێ پێکردن لە نووسین و دوواندا.
*v.t.* بە لاقرتێ وە ووتن؛ گاڵتەپێکردن؛ بە لچ لێ هەڵقورتانەوە دەربڕین.
*n.* (١) گاڵتە پێ هاتن؛ لاقرتێ پێکردن؛ لچ لێ هەڵقورتان.
(٢) لاقرتێ؛ قسەی بە تەوسەوە یا قەشمەری.
-**sneerer** *(n.)*; **sneerful** *(adj.)*; **sneeringly** *(adv.)*.
**sneeze** (snēz), *v.i.* پژمین.
*n.* پژمە؛ پژمین.
**not to be sneezed at,** گاڵتەی پێ ناکرێ؛ کەم نییە؛ بە کەم دانانرێ؛ گاڵتە نییە: *( A salary of thirty thousand dollars a year is not to be sneezed at.)*
**sneeze-weed** (snēz′wēd´), *n.* گیاپژمە: ڕووەکێکی زبرە مرۆڤ دەهێنێتە پژمە.
**sneeze-wort** (snēz′wûrt´), *n.* گیا برنووتی: ڕووەکێکی بۆن تیژی گوڵ سپییە گەڵاکەی برنووتی لێ درووست دەکرێ.
**sneezy** (snēz′i), *adj.* (١) زۆر دەپژمێ. (٢) مرۆڤ دەهێنێتە پژمێ.
**snell** (snel), *adj.* [Dial.], (١) خێرا؛ گورج وگۆڵ.
(٢) زیرەك؛ زرنگ. (٣) تیژ (با)؛ سارد؛ سەخت: *( A ~ wind smote us.)*
(٤) توندوتیژ.
**snell** (snel), *n.* ژێیەکی کورتە قولاپی ڕاوەماسی پێوە دەبەسترێت بە ژێ سەرەکییەکەوە.
**snick** (snik), *n.* (١) لەلە؛ تلیش؛ بڕینێکی کەم؛ کەل.
(٢) لێدانی تۆپ بە لابەلایی (یاری کریکێت).
*v.t.* (١) بڕین بە ئاستەم؛ کەل کردن؛ لەکەکردن؛ درزتێکردن.
(٢) لێدانی تۆپ بە لابەلایی (یاری کریکێت). (٣) بە توند لێدان یا پیاکێشان.
**snick** (snik), *n.* قرتە؛ تەقە.
*v.t. & v.i.* قرتەکردن؛ تەقە لێ هەڵسان.
**snicker** (snik′ēr), *v.i.* (١) بە دزییەوەو بە بێ دەنگ پێکەنین؛ پێ پێکەنین بە بێ دەنگ؛ بزەگرتن (لەڕووی گاڵتەپێکردن یا پێکەنینەوە):
*( The class ~ed at the teacher's mistake.)*
(٢) حیلاندن.

***n.*** پێکەنینێکی بێ دەنگو بە دزیەوە؛ بزە (لەڕووی گاڵتەپێکردن یا پێکەنینەوە).

**snickersnee** (snik′ẽr-snē′), ***n.*** چەقۆی زل (بەتایبەتی کە وەك چەك بەکاربهێنرێ)؛ کێرد

**snide** (snīd), ***adj.*** [Slang], بڕ (توانج، لاپلار، قسەی بە تەوسەوە)؛ ناشرین یا لەڕووی سووکیەوە وتراو: *( a ~ remark)* .

**sniff** (snif), ***v.i.*** (١) بۆن پێوەکردن؛ بۆن کردن (بە جۆرێك کە مشەی لووت بێت)؛ لووت بۆ بردن بۆ بۆن پێوەکردن؛ مشەهاتن.
(٢) ( at ~ ) ، گاڵتەپێکردن(لەڕێی بۆن پێوەکردن و مشەی لووت هاتنەوە)؛ بە سووکی سەیرکردن؛ لاقرتێ پێکردن. (٣) بۆن پێوەکردن لەبەر بۆن خۆشی.

***v.t.*** (١) بۆن پێوەکردن؛ بۆن کردن؛ مشەمش کردن
(٢) تاقیکردنەوە بە بۆن پێوەکردن
(٣) هەستپێکردن؛ بۆن کردن (مەجاز)؛ گومان پەیداکردن:
*( We ~ed danger in the man's manner.)*

***n.*** (١) بۆن کردنێك؛ مشەی لووت لە کاتی بۆن پێوەکردندا؛ مشەمش.
(٢) شتێکی بۆن کراو؛ شتێکی هەستپێکراو یا دۆزراوە لە ڕێی بۆن کردنەوە؛ بۆن

**sniffle** (snif′'l), ***v.i.*** چڵم هەڵ لووشین؛ مشەمش کردن؛ مشەی لووت هاتن.

***n.*** مشەمش؛ مشەی لووت؛ چڵم هەڵ لووشین و دەنگەکەی.

**the sniffles,** [Colloq.], (١) هەڵامەت.
(٢) چڵم هەڵ لووشین و مشەمشی دوای گریان.

**sniffy** (snif′i), ***adj.*** [Colloq.], کەشخەچی؛ لووت بەرز؛ بەفیز؛ بە سووك سەیری خەڵك و شت کەر.

**snifter** (snif′tẽr), ***n.*** (١) پەرداخی دەم تەسکی خواردنەوەی مەستکەر (بۆ هێشتنەوەی بۆنەکەی). (٢) [Slang]، پێکێکی بچووکی خواردنەوەی مەستکەر

**snigger** (snig′ẽr), ***n. v.t. & v.i.*** = **snicker.**

**sniggle** (snig′'l), ***v.i. & v.t.*** ڕاوە مارماسی کردن (بە قولاپ خستنە کونەکانیانەوە)

**snip** (snip), ***v.t. & v.i.*** بە مەقەست بڕینەوە؛ بە مقەست هەڵدڕین.

***n.*** (١) بڕینێکی کەم بە مەقەست. (٢) دەنگی بە مەقەست بڕین یا بڕینەوە.
(٣) (ا) سەرەمەقەست؛ والا. (ب) پارچەی بچووك.
(٤) (*pl.*) مەقەستی قورسی تەبەقە کانزا بڕینەوە.
(٥) [Colloq.]. هەرزەیەکی بچووك و بێ بایەخ؛ شتێکی بچووك و هیچوپووچ.
(٦) [Slang]. کارێکی ئاسان؛ شتێکی بە ئاسانی جێبەجێکراو؛ ئیشی سووك.

**snipe** (snīp), ***n.*** (١) قوڕاوینکە؛ قوڕاویلە؛ باڵندەیەکی دەنووك درێژی ناو زەلکاوە (٢) تەقەیەکە لە شوێنێکی نهێنییەوە لە دوژمن بکرێت.
(٣) [Slang]. قنگە جگەرە.

***v.i.*** (١) ڕاوکردنی قوڕاویلە؛ تەقە لە قوڕاویلە کردن
(٢) تەقە لە دوژمن کردن لە شوێنێکی نهێنییەوە (بە مشت لێ گرتنەوە).

**sniper** (snīp′ẽr), ***n.*** نیشانچی؛ نیشان شکێن: (ا) سەربازێکی نیشانچییە کە نیشان لە دوژمن دەگرێتەوە لە دوورەوە؛ نیشانگر لە دووژمن.
(ب) کەسێکە کە تەقە دەکات لە شوێنێکی نهێنییەوە.

**snippet** (snip′it), ***n.*** (١) پارچەیەکی بچووك؛ سەرەمەقەست.
(٢) [Colloq.]. کەسێکی گەنجی بچووکی بێ بایەخ؛ کەسێکی هیچوپووچ.

**snippety** (snip′it-i), ***adj.*** (١) پچڕپچڕ؛ لە شتی پارچە پارچە یا سەرەمەقەست دروستکراو (٢) [Colloq.]. snippy

**snippy** (snip′i), ***adj.*** (١) پچڕپچڕ؛ لە شتی پارچە پارچە یا سەرەمەقەست دروستکراو. (٢) [Colloq.]. ووشك و بێ نەزاکەت؛ بێ حەیا؛ قسە ووشك و ڕەق.

**snitch** (snich), ***v.t.*** [Slang], دزین (بەتایبەتی شتی کەم نرخ).

***v.i.*** [Slang], (١) دزی کردن (بەتایبەتی هی شتی کەم نرخ).
(٢) ( on ~ ). خەبەرلێدان؛ دەنگوباس ڕاگەیاندن دژی کەسێك:
*( to ~ on somebody)*

***n.*** [Slang], خەبەرلێدەر؛ دەنگوباس ڕاگەیێنەر دژی کەسێك؛ سیخوڕ.

**snivel** (sniv′'l), ***v.i.*** (١) چڵم بە لووتدا هاتنەخوارەوە.
(٢) **sniffle** . (٣) فنگەفنگ کردن؛ گریان و چڵم هەڵ لووشین.
(٤) کڕوزانەوە؛ نووزانەوە؛ نووزەنووزکردن.
(٥) گریان بە درۆوە (بۆ هاوسۆزی پیشاندان یا خەفەتباری نواندن).

***n.*** (١) چڵمی بە لووتدا هاتەخوارەوە؛ چڵم.
(٢) چڵم هەڵ لووشین؛ مشەمش کردن؛ دەنگی چڵم هەڵ لووشین.
(٣) گریانی درۆ؛ نووزانەوە؛ نووزەنووز؛ کڕوزانەوە.

-**sniveler; sniveller** ***(n.).***

**snob** (snob), ***n.*** (١) کەسێکی بێ سامان و بێ پلەوپایەی کۆمەڵایەتی.
(٢) کەسێکە کە زۆر بایەخ دەدات بە پارەداری و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و هەمیشە خۆی دەباتە پێشەوە لەوانەی لە خۆی دەوڵەمەندترو پلەوپایە بەرزترن.
(٣) کەسێکە کە خۆی بە زلترو باشتر دادەنێ لە خەڵك؛ کەسێکی لووت بەرز، لەخۆبایی، بەفیز ...هتد.

**snobbery** (snob′ẽr-i), ***n.*** خۆ بە زلترو باشتر دانان لە خەڵك؛ لووت بەرزی؛ لە خۆ بایی بوون؛ خەڵك لە خۆ بە کەمتر دانان.

**snobbish** (snob′ish), ***adj.*** خۆ بە زلترو باشتر دانەر لە خەڵك؛ لووت بەرز؛ کەشخەچی؛ لەخۆبایی؛ لە کەسێکی لووت بەرز هاتوو.

-**snobbishly** ***(adv.)***; **snobbishness** ***(n.).***

**snobbism** (snob′i-z'm), ***n.*** = **snobbery.**

**snobby** (snob′i), ***adj.*** = **snobbish.**

**snood** (snōōd), ***n.*** (١) گێسووبەندی کچ؛ شریتێکە کچان دەیان بەست بە دەوری سەریاندا. (٢) تۆڕی قژی ئافرەت تێخستن لە دواوە.
(٣) ژێیەکی کورتە قولاپی ڕاوەماسی پێوە دەبەسترێت بە ژێ سەرەکییەکەوە

***v.t.*** قژ بەستنەوەو ڕاگرتن بە گێسوبەند یا تۆڕ.

**snook** (snöök), ***n.*** جۆرە ماسییەکی دەریاییە

**snooker** (snōōk′ẽr), ***n.*** یارییەکە وەك بلیارد.

**snoop** (snōōp), ***v.i.*** [Colloq.], سووسەکردن؛ چاو پێداگێڕان بە دزییەوە؛ بە دزییەوە تێڕوانینە شت و شوێنی کەسێکی تر (بۆ مەبەستی خراپ): *( He was ~ing around her house.)* .

***n.*** [Colloq.], (١) سووسەکەر؛ کەسێکە کە بە دزییەوە چاو دەگێڕێ بە شت یا جێگەی کەسێکی تردا بۆ مەبەستێکی خراپ. (٢) چاو پێداگێڕانێکی وەها.

**snoopy** (snōōp′i), ***adj.*** [Colloq.], سووسەکەر؛ حەز لە چاو پێداگێڕانی شت و جێگەی خەڵك دەکات بە دزییەوە بە مەبەستی خراپ.

**snoot** (snööt), ***n.*** [Colloq.], (١) (ا) لووت.
(ب) **snout** . (٢) دەموچاو.
(٣) دەموچاوی خۆ ناشرین کردن بۆ گاڵتەپێکردن یا قێز لێ هاتنەوە.
(٤) **snob** .

**snooty** (snööt′i), ***adj.*** [Colloq.], (١) لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ خۆ لە خەڵك بە زلترو باشتر دانەر؛ تڕزل.
(٢) لووت بەرزو تڕزلانە: *( ~ stare)* .

-**snootily** ***(adv.)***; **snootiness** ***(n.).***

**snooze** (snōōz), ***n.*** سەرخەو؛ کەرووێشکەخەو؛ قنگەخەو.

***v.i.*** سەرخەو شکاندن؛ قنگەخەوکردن.

**snore** (snȯr, snōr), ***v.i.*** پرخاندن؛ پرخەهاتن؛ پرخەپرخەکردن.

***n.*** پرخە؛ پرخەپرخ.

**snorkel** (snôr′k'l), ***n.*** (١) ئامێری هەوای پاك وەرگرتن و هی پیس دەرکردنی ژێر دەریا. (٢) بۆری هەناسەدانی مەلەوانی ژێرئاو (کە سەرەکەی بەسەر ئاوەوەیە).

***v.i.*** مەلەکردن لە ژێرئاودا بەهۆی بۆری هەناسەدانەوە.

**snort** (snôrt), ***v.i.*** (١) (ا) پڕماندن؛ پڕمەکردن؛ کورکەکورك کردن؛ کورکاندن: *( The horse ~ed at our approach.)* .
(ب) مرخەمرخ کردن؛ مرقەمرق کردن؛ مرخەهاتن.
(٢) تووڕەیی و ناڕەزایی و لاقرتێ دەربڕین بە مرقەیەك.

(٢) دەنگێکی وەك مرقە لێوەهاتن: *(The motor ~ed and stopped.)*.
(٤) [Colloq.]، دانە مرقەی پێکەنین.
*v.t.* (١) پرماندن: پرمەکردن؛ کورکەکورك کردن. (٢) بە پرمە یا مرخە دەربڕین.
(٣) بە لووت هەڵمژین یا کێشانی کۆکایین: *(to ~ cocaine)*.
*n.* (١) پرمە؛ مرقەمرق؛ مرخە.
(٢) [Slang]. پێکێکی بچووکی خواردنەوەی مەستکەر کە بە یەك قوم بخورێتەوە.

**snot** (snot), *n.* (١) چڵم
(٢) [Slang]. کەسێکی پیسی بۆگەن؛ کەسێکی بێ نرخ.

**snotty** (snot′i), *adj.* (١) چڵمن؛ پیس.
(٢) [Slang]، (ا) پیس و بۆگەن؛ بێ نرخ. (ب) لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ ترنل.

**snout** (snout), *n.* (١) لموز: قەپوز.
(٢) لوولە (مەسینە، لوولینە، کتلی... هتد).
(٣) [Slang]، لووت، لووتی زل؛ کەپوو.

**snout beetle,** قالۆنچەی لموزدار (دانەوێڵە و میوە دەخوات).

**snow** (snō), *n.* (١) بەفر (٢) بەفر بارین.
(٣) (ا) شتێکی وەك بەفر. (ب) خاڵی سپی سەر تەلەفزیۆن.
(٤) [Poetic]. سپێتی. (٥) [Slang]، کۆکایین؛ هێرۆویین.
*v.i.* بەفر بارین
*v.t.* (١) بە بەفر داپۆشین؛ ڕێ لێ گیران بە بەفر؛ ڕێ لێ بڕان بە بەفر:
*(They were ~ed in after the blizzard.)*
(٢) پرش و بڵاوکردنەوە.
(٣) [Slang]. کارتێکردن و پێ سەلماندن بە مەرایی و قسەی زل و درۆ؛ ڕاکێشانە لای خۆ بە قسەی زل و جوان و مەرایی.

**snow-ball** (snō′bôl′), *n.* (١) تۆپەڵە بەفر.
(٢) ڕووەکێکی گوڵ سپییە.
*v.i.* (١) کەڵەکەبوون؛ لەسەر یەك کۆمەڵ بوون؛ هەمیشە و خێرا زیادبوون (قەبارە، گرنگی، مەترسی). (٢) تۆپەڵە بەفر هاویشتن.
*v.t.* تۆپەڵە بەفر تێگرتن؛ تۆپەڵە بەفر پێدادان.

**snowbank** (snō′baŋk′), *n.* کلیلە کۆمەڵە بەفرێکە کە با پێچی دابێ و کۆی کردبێتەوە بە قەدپاڵێکەوە یا لە شیوێکدا.

**snow-berry** (snō′ber′i, snō′bēr-i), *n.* (١) ڕووەکێکە بەری سپی و خڕ دەگرێ. (٢) بەری ئەم ڕووەکە.

**snow-bird** (snō′bûrd′), *n.* (١) باڵندەیەکی بچووکە لە توخمی فیسقە پشتی بۆرە و بەرسنگی سپییە. (٢) [Slang]، خووگری کۆکایین و هێرۆویین.

**snow-blind** (snō′blīnd′), *adj.* بەفرکوێر: کوێری سەردەمی بەهۆی لە چاودانی تیشکی ڕۆژی سەر بەفرەوە.

**snow-blindness,** بەفرکوێری (وشەی پێشوو سەیرکە).

**snow-bound** (snō′bound′), *n.* ڕێ لێ گیران بە بەفر؛ لە بەفردا چەقین.

**snow-broth** (snō′brôth′), *n.* (١) لیتاو؛ بەفراو.
(٢) خواردنەوەی مەستکەری سارد.

**snow bunting,** باڵندەیەکی بچووکی ناوچە باکوورە بەفرینەکانە لە توخمی فیسقەیە. (هەروەها " snow-flake ").

**snow-bush** (snō′boosh′), *n.* دەوەنێکی گوڵ سپییە.

**snow-cap** (snō′kap′), *n.* کڵاوە بەفری سەر لووتکەی شاخ یا پۆپەی دار

**snow-capped** (snō′kapt′), *adj.* بەفرگرتوو (لووتکەی شاخ، پۆپەی دار)؛ بە بەفر داپۆشراو: *(~ mountains)*.

**snow-clad** (snō′klad′), *adj.* [Poetic], بەفرگرتوو؛ بە بەفر داپۆشراو.

**snow-drift** (snō′drift′), *n.* (١) کلیلە؛ بەفرێکی زۆرە کە با لە پەنایەکدا پێچی دابێ و کۆی کردبێتەوە؛ کەڵەکە بەفر.
(٢) بەفرێکە کە با پێچی بداو ڕایماڵێ

**snow-drop** (snō′drop′), *n.* (١) ڕووەکێکی گوڵ سپی و شۆڕبووەوەیە. (٢) گوڵی ئەم ڕووەکە. (٣) گوڵاڵە؛ گوڵە نیسان.

**snow-fall** (snō′fôl′), *n.* (١) بەفر بارین.
(٢) تێکڕای بەفری باریو لە ماوەیەك یا ناوچەیەکی تایبەتیدا.

**snow-flake** (snō′flāk′), *n.* (١) کولۆ بەفر؛ پرووشە بەفر.
(٢) snow bunting. (٣) snow-drop

**snow-goose** (snō′gōōs′), *n.* قازە بەفرینە (لە ناوچە باکوورە بەفرینەکان دەژی پەڕو باڵی سپییە و سەری باڵەکانی ڕەشە).

**snow job,** [Slang], کارتێکردن و پێ سەلماندن و ڕاکێشانە لای خۆ بە قسەی زل و فیشاڵ و مەرایی؛ قسەی زل و فیشاڵ و مەرایی:
*(He did a ~ on the manager and got a job.)*

**snow leopard,** پڵنگە بەفرینە؛ پڵنگی سپی.

**snow line** (or **limit**), دامێنی شاخێك یا ناوچەیەکی هەرگیز بەفر نەچووەوە.

**snow-man** (snō′mən′), *n.* شێرەبەفرینە.

**snow-mobile** (snō′mō′b'l), *n.* ئۆتومبیلی بەفر.

**snow plant,** ڕووەکێکی ئەمەریکی بێ گەڵای گوڵ سوورو شۆڕبووەوەیە لە دارستانە کاژەکاندا دەڕوێت لە بەهاردا پێش توانەوەی بەفر

**snow-plow** (snō′plou′), *n.* بەفرماڵ (بەفری شەقام و ڕێگەوبان و ڕێی شەمەندەفەری پێ دەماڵرێ).

**snow pudding,** محەللەبی سپی: لە سپێنەی هێلکەی شڵەقاو و شەکرو جەلاتین دروست دەکرێ.

**snow-shed** (snō′shed′), *n.* سایەبانی سەر هێڵی شەمەندەفەر (بۆ ئەوەی بەفر دای نەپۆشێ).

**snow-shoe** (snō′shōō′), *n.* پێڵاوی بەفر
*v.i.* پێڵاوی بەفر لەپێکردن.

**snow-slide** (snō′slīd′), *n.* هەرەسدانی بەفر.

**snow-storm** (snō′stôrm′), *n.* بەفرێکی زۆر بە بایەکی قایمەوە؛ بەفروبا؛ زریانی بەفر.

**snow tire,** تایەی بەفر (بۆ نەخلیسکانی ئۆتومبیل لەسەر بەفرو سەهۆڵ).

**snow-white** (snō′hwīt′), *adj.* سپی وەك بەفر؛ چوڕ؛ لە سپێتیدا لە بەفر دەکات.

**snowy** (snō′i), *adj.* (١) بەفراوی: بە بەفر داپۆشراو؛ بەفرگرتوو:
*(a ~ valley)*
(٢) بەفرین؛ بەفری؛ بە بەفر کراو.
(٣) (ا) سپی: سپی وەك بەفر؛ بەفری. (ب) پاك؛ خاوێن.

**snub** (snub), *v.t.* (١) قسە پێ بڕین بە ناشرینانە؛ سەرزەنشتکردن؛ شکاندن. (٢) (ا) وەستاندن؛ لە جووڵانەوە خستن (وەك گوریسێك یا پەتێك بە پێچانەوەی بە دەوری سنگێکدا). (ب) لە پڕ وەستاندن یا بەستنەوە (وەك وڵاخێك یا بەلەمێك بە گوریس بە دەوری سنگێکدا).
(ج) ڕاگرتن؛ وەستاندن؛ دابینکردن: *(to ~ a vibration)*
(٣) لە لووت دان (بە ڕێز نەگرتن و خستنە پشت گوێ)؛ شکاندن: بە ناشرینی و سووکی لەگەڵ ڕەفتارکردن بەتایبەتی کە ئەم جۆرە ڕەفتارە چاوەڕوان نەکرابێ:
*(They ~bed the ambassador by not inviting him to the party.)*
(٤) کوژاندنەوە بە پلیشاندنەوە: *(to ~ out a cigarette)*.
*n.* (١) لە لووت دان؛ شکاندن؛ کردەوەیەکی ناشرینانە و چاوەڕوان نەکراو بەرامبەر بە یەکێك: *(He considered it a ~.)*.
(٢) وەستان؛ دابینکردن؛ ڕاگرتن.
*adj.* (*Also* snubbed), هەڵگەڕاوە (لووت)؛ قوت:
[a ~ (or snubbed) nose].

**snubber** (snub′ēr), *n.* (١) شتی پێ وەستێنەر یا پێ بەستراوە (گوریس، پەت). (٢) shock absorber.

**snubby** (snub′i), *adj.* (١) کورت و هەڵگەڕاوە (لووت)؛ قوت (لووت). (هەروەها " snub ")، (٢) snub-nosed.

(٢) خەلك شكێن؛ لە لووتی خەلك دەر (بە ڕێز نەگرتن و خستنە پشت گوێ).

**snub-nosed** (snub′nōzd´), *adj.* لووت كورت و مەنگەڕاوە؛ لووت قوت.

**snuff** (snuf), *n.* سەرە سووتاو و ڕەشەكەی پلیتە مۆم

*v.t.* (١) بڕین یا قرتاندنی سەرە ڕەش و سووتاوەكەی پلیتە مۆم و چرا.
(٢) مۆم كوژاندنەوە بە دەست یا بە " **snuffers** "

**snuff out,** (١) كوژاندنەوە (مۆم، چرا). (٢) دوایی پێ هێنان (ژیان)؛ كوژاندنەوە؛ نەهێشتن؛ كۆتایی پێ هێنان؛ لەناو بردن:
*( an accident that snuffed out a life)*

**snuff** (snuf), *v.t.* (١) بۆن كردن؛ هەلمژین. (٢) بۆن پێوەكردن.

*v.i.* (١) بۆن كردن؛ پرمان
(٢) [Rare]، برنووتی هەلمژین؛ برنووتی كردنە لووتەوە.

*n.* (١) بۆن كردن؛ دەنگی بۆن پێوەكردن؛ مشەمش
(٢) (ا) برنووتی. (ب) نەختێك برنووتی كە لە یەك جاردا بە لووت هەلدەمژێنرێ.
(٣) تۆزی بە لووت هەلمژێنراو (دەرمان، كۆكایین).
(٤) بۆن؛ بۆن و بەرامە.

**up to snuff,** [Colloq.]. (١) باش؛ پەسەند (تەندرووستی، چۆنێتی)؛ لێهاتوو؛ بلە بەرز. (٢) وریا؛ هۆشیار؛ بە ئاسانی ناخەلەتێ

**snuff-box** (snuf′boks´), *n.* قوتووی برنووتی

**snuffers** (snuf′ẽrz), *n.pl.* شتێكی وەك مەقەست مۆمی پێ دەكوژێنرێتەوە.

**snuffle** (snuf′'l), *v.i.* (١) مشەمش كردن؛ مشانن؛ هەناسەبڕكێ پێكەوتن (وەك سەگ). (٢) بە لووت قسەكردن یا گۆرانی وتن؛ منگەمنگ كردن (٣) [Rare]، نووزەنووزكردن؛ نووزانەوە؛ كرووزانەوە بە درۆ.

*v.t.* بە منگەمنگ وتن؛ بە لووت وتن

*n.* (١) مشەمش؛ مشانن؛ هەناسەبڕكێ.
(٢) منگە؛ منگەمنگ؛ دەنگی بە لووت كراو.
(٣) [Rare]، نووزەنووز، كرووزانەوەی درۆ.

**the snuffles,** لووت گیران؛ لووت گیراوی؛ هەلامەت.

**snuffy** (snuf′i), *adj.* (١) لە برنووتی دەچێ.
(٢) برنووتی بەكاردەهێنێ. (٣) برنووتی پێوەیە؛ پیس بووە بە برنووتی؛ لەكاوی بووە (٤) ناپەسەند.

**snug** (snug), *adj.* (١) گەرم و گوڕە و لە ئاسوودەدایە؛ ئاسوودەدار:
*( They looked so ~ sitting there together by the fireplace.)*
(٢) بچووك و خنجیلە و خۆش: *( a ~ cottage, apartment, etc.)* .
(٣) بەس؛ بەش دەكات (دەسكەوت)؛ باش: *( a ~ income)* .
(٤) چەسپ؛ پڕ بە بەر؛ پڕ بە پڕی خۆیەتی (بەرگ): *( a ~ jacket)* .
(٥) چاك دروستكراو (كەشتی)؛ پتەو؛ قایم؛ بەرگەی زریان دەگرێ.
(٦) شاراوە؛ نەبینراو.

*adv.* بە ئاسوودەیی و گەرم و گوڕی.

*v.i.* [Dial.], = snuggle.

*v.t.* (١) پڕ بەبەركردن (جل و بەرگ).
(٢) خۆش و گەرم و گوڕ و ڕێك و پێك كردن:
*( to ~ the cottage for winter)*
(٣) شاردنەوە (٤) قایم كردن.

**snug down,** خۆ ئامادەكردن بۆ زریان (بە هەلكردنی بایەوان و قایم كردن و بەستنەوەی شتی نەچەسپاوی ناو كەشتی).

**snuggery** (snug′ẽr-i), *n.* شوێنێك یا شتێكی خۆش و بە ئاسوودە

**snuggle** (snug′'l), *v.i. & v.t.* خۆتێهەلسوون و چوونە باخەلەوە بۆ گەرم و گوڕی و خۆشەویستی؛ لێ نزیكبوونەوە بۆ گەرم و گوڕی:
*( She ~d up to him.)*

**so** (sō), *adv.* (١) بەم جۆرە؛ ئاوا؛ وەها؛ وەك ئەوە:
*( Hold the bridle ~ .)*
(٢) (ا) ئەوەندە *( Why are you ~ late? It is not ~ hot today.)* .
(ب) زۆر؛ ئێجگار؛ ئەوەندە *( They are ~ happy together.)* .
(٣) لەبەرئەوە: *( They were late, and ~ didn't go.)*
(٤) نزیكەی: *( He won fifty dollars or ~ )* .
(٥) هەروەها؛ - یش: *( She enjoys music, and ~ dose he.)* .
(٦) بێ گومان؛ گومانی تێدا نییە: *( I did ~ tell the truth!)* .
(٧) كەوابوو؛ وا دیارە: *( ~ you realy don't like my haircut.)* .
(٨) [Colloq.]، ئێجگار زۆر: *( She ~ wants to go.)* .

*conj.* (١) بۆئەوەی؛ تاكو؛ تا:
**| He died ~ (that) we might be free.|**
(٢) لەبەرئەوە: *( It was late, ~ we went home.)* .
(٣) بەمەرجێك كە.

*pron.* (١) بەو جۆرە؛ وەها:
*( He was a poor man, but he did not remain ~ .)*
(٢) نزیكەی.

*interj.* كەواتە؛ كەوابوو؛ وا دیارە:
*( ~ you've lost your job!)*

**and so on (or forth),** وە هەروەها؛ وە هی تریش؛ هەتا دوایی.

**so as,** (١) بۆئەوەی؛ تاكو. (٢) بەمەرجێك كە.

**so what?** [Colloq.], جا چی بووە؟؛ چش !؛ ئینجا چییە؟؛ جا با وا بێ!.

**soak** (sōk), *v.t.* (١) خووساندن؛ باش تەڕكردن؛ نوقوم كردن لە ئاو یا شلەدا. (٢) (ا) ( ~ **up** ) ، هەلمژین (ئاو، شلە):
*( Blotting paper ~s up ink.)*
(ب) ( ~ **up** ) وەرگرتن؛ هەلمژین (مەجاز): *( I ~ed up the sunshine.)* .
(٣) ( ~ **up** ) بە مێشك وەرگرتن؛ بە ئاسانی تێگەیشتن؛ چوون بە مێشكدا.
(٤) [Colloq.]، زۆر خواردنەوە؛ مەست بوون.
(٥) [Slang]، پیامالین؛ زرمە لێ هەلسان؛ مستەكۆلە لێدان.
(٦) [Slang]، پارە زۆر لێسەندن؛ ڕووتكردنەوە (مەجاز):
*( The government ~ed the taxpayers.)*
(٧) [Slang]، سەرخۆش كردن؛ مەستكردن.
(٨) [Slang]، بارمتەكردن؛ لە بارمتەدا دانان.

*v.i.* (١) خووسان؛ زۆر باش تەڕبوون.
(٢) چوونەناو؛ تێ چوون: *( The fact ~ed into his head.)* .
(٣) [Colloq.]، زۆر خواردنەوە؛ سەرخۆش بوون.

*n.* (١) خووسان؛ زۆر باش تەڕبوون؛ خووسێنران.
(٢) خووساوی. (٣) ئاو یا شلەی شت تێدا خووسان.
(٤) [Slang]، كەسێكی مەست یا سەرخۆش.
(٥) [Slang]، زۆر خواردنەوە؛ مەست بوون؛ مەستی.
(٦) [Slang]، لە بارمتەدا بوون یا دانران: *( in ~ )* .
(٧) [Slang]، مستەكۆلەی قایم؛ مستەكۆلە.

**soak out,** لێ دەرهێنان بە خووساندن:
*( to soak the dirt out)*

**soakage** (sōk′ij), *n.* (١) خووسان؛ خووسێنران.
(٢) ئاو و شلەی هەلمژراو؛ ئاو و شلەی لێ چوو یا دەلێو.

**so-and-so** (sō′'n-sō´), *n.* (١) ئەم و ئەو؛ فلان و فیسار؛ فلانە كەس؛ یارۆ: *( Never mind what ~ says.; Tell me to do ~ .)* .
(٢) [Colloq.]، جوێنی ناونەبراو؛ وشەیەكە لە باتی جوێن وەك: سەگباب، ناپیاو، بێ شەرەف... هتد: *( That ~ .; He's a real ~ .)* .

**soap** (sōp), *n.* (١) سابوون؛ پێشۆر.
(٢) كانزا خوێی ترشەلۆكی چەور. (٣) [Slang]، پارەی بە بەرتیلدا دراو.
(٤) **soap opera** .

*v.t.* (١) سابوون لێدان؛ سابوون لێخستن. (٢) مەرایی كردن.

**no soap,** [Slang], (١) پێشنیارەكە پەسەند نەكرا؛ شتەكە ڕێ نەكەوت یا سەری نەگرت. (٢) بێ سوود؛ بێ كەلك؛ سەرنەكەوتوو

**soap-bark** (sōp′bärk´), *n.* (١) دارە سابوونی: درەختێكە گەلاكەی وەك چەرم وایە و گوڵی سپی دەگرێ و قەدەكەی شتی پاك كردنەوەی لێ

دروست ئەکرێ. (٢) داری ئەم درەختە.

**soap-berry** (sōp′ber´i, sōp′bēr-i), *n.* (١) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی لە سابوون دەچێ. (٢) بەرە نەرمە سابوونییەکەی ئەم درەختە.

**soap-box** (sōp′boks´), *n.* (١) سنووقی سابوون.
(٢) سنووقی ووتاربێژ: سنووقێکە ووتاربێژ لەسەری رادەوەستێ لەسەر شەقامو لە شوێنی گشتیداو ووتار بۆ خەڵك دەدات.
*adj.* تایبەتی بەم جۆرە ووتارو ووتاربێژانە.
*v.i.* ووتاردان بۆ خەڵکی سەر شەقامو ناو شوێنی گشتی.

**soap bubble,** (١) بلقە سابوون.
(٢) شتێکی سەردەمی یا کەم خایەن.

**soapiness** (sōp′i-nis), *n.* سابوونێتی؛ لە سابوون چوون.

**soap opera,** شانۆنامەی زنجیرەیی سەر رادیۆ یا تەلەفزیۆنی بەسۆزە دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتیو خێزانیو دڵداری .. هتد.

**soap plant,** رووەکە سابوون: هەر جۆرە رووەکێکە رەگو بەرو گەڵاکەی لەباتی سابوون بەکاربهێنرێت یا سابوونی لێ دروست بکرێ.

**soap-stone** (sōp′stōn´), *n.* بەردە سابوون: بەردێکی خۆڵەمێشی مەیلەو سەوزی نەرمە زوو وورد دەبێ؛ پۆدرە (هەروەها " steatite ").

**soap-suds** (sōp′sudz´), *n.pl.* کەفە سابوون؛ سابووناو.

**soap-wort** (sōp′wûrt´), *n.* رووەکێک گەڵاکەی شیلەیەکی سابوونی لێ دێتەدەرەوە کە برینداری دەکرێ.

**soapy** (sōp′i), *adj.* (١) سابووناوی؛ سابوونی تێدایە؛ سابوون داپۆشیوە. (٢) سابوونی؛ لە سابوون دەچێ.
(٣) [Slang]: (أ) لووس؛ خڕ؛ چەور؛ پۆزناوی. (ب) زمان لووس؛ مەراییکەر.

**soar** (sôr, sōr), *v.i.* (١) بەرز فڕین؛ فڕین بە ئاسماندا؛ باڵ گرتن.
(٢) بە ئاسماندا کشان (فڕۆکە). (٣) بەرزبوونەوە؛ بڵندبوونەوە؛ فڕین (مەجاز)
*n.* (١) بەرز فڕین؛ باڵ گرتن؛ فڕین.
(٢) ئەو بەرزییەیە کە فڕۆکە یا باڵندە دەیگاتێ لە فڕینا؛ مەودای فڕین.

**sob** (sob), *v.i.* (١) گریان بە کوڵ؛ هەنسکدان؛ هەنسکەهەنسکدان؛ دانە پڕمەی گریان. (٢) دەنگێکی وەك هەنسکەهەنسك لێوەهاتن.
*v.t.* (١) بە هەنسکەوە ووتن؛ بە گریانەوە ووتن.
(٢) خەو لە خۆ خستن بە گریانو هەنسکدان:
*( The child ~bed herself to sleep.)*
*n.* (١) هەنسکدان؛ دانە پڕمەی گریان؛ بە کوڵ گریان
(٢) هەنسك؛ هەنسکەهەنسك؛ پڕمەی گریان؛ گریانێکی بە کوڵ.

**sober** (sō′bēr), *adj.* (١) زۆر کەم خواردنەوەی مەستکەر دەخواتەوە.
(٢) سەرخۆش نییە؛ نامەست؛ بەهۆش؛ بەئاگا.
(٣) سەنگین؛ سەلار؛ ئاغر؛ لەسەرخۆ؛ هێمن.
(٤) خاکی (جلوبەرگ)؛ رەنگ؛ رەنگاورەنگ نییە؛ سادە.
(٥) بە بێ زیادەپێوەنان؛ بە بێ گۆڕین یا شێواندن؛ لە راستیدا چۆنە وەها:
*( the ~ truth)*
*v.t. & v.i.* ( ~ up; ~ down ), هێمن کردنەوە؛ هێمن بوونەوە؛ هاتنەوە سەرخۆ؛ هۆش هاتنەوەبەر (پاش مەستی یا سەر لێ تێکچوون).

**sober-minded** (sō′bēr-mīn´did), *adj.* هێمن؛ لەسەرخۆ؛ سەرخۆش نییە.

**sobriety** (sō-brī′ə-ti), *n.* (١) ناسەرخۆشی؛ نامەستی؛ هۆش بەخۆ بوون؛ زۆر نەخواردنەوە. (٢) هێمنی؛ سەلاری؛ ئاغری؛ سەنگینی؛ لەسەرخۆبوون.

**sobriquet** (sō′bri-kā´), *n. Also* soubriquet, ناوی نهێنی؛ ناوی خوازراو.

**sob sister,** [Slang], (١) ژنە رۆژنامەچییەکە کە چیرۆکی بەسۆز دەنووسی. (٢) کەسێکی لە ئەندازە بەدەر بەسۆز یا سۆزپەرست.

**sob story,** چیرۆکێکی پڕ لە رووداوی ناخۆشە بۆ کەسێك دەگێڕێتەوە بۆ هەست راکێشانیو هاوسۆزیو بەزەیی پێداهاتنەوە:
*( After failing the test, she told her teacher a ~ in order to make him change her grade.)*

**socage** (sok′ij), *n.* بە کرێ گرتنی زەوی دەرەبەگی ئینگلیزی سەدانی ناوەڕاست یا بە پارە یا بەرامبەر بە ئیش کردن بۆ دەرەبەگەکە.

**so-called** (sō′kôld´), *adj.* بەناو؛ هەر بەناو؛ وا ناوبراو؛ وا ناسراو:
*( He is a ~ liberal.)*

**soccer** (sok′ēr), *n.* فتبۆڵێن؛ تۆپ تۆپێن؛ یاری شەق شەقێن؛ تۆپی پێ.

**sociability** (sō´shə-bil′ə-ti), *n.* کۆمەڵخوازی؛ خەڵك خوازی؛ حەزکردن بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵکدا.

**sociable** (sō′shə-b′l), *adj.* (١) کۆمەڵخواز؛ خەڵك خواز؛ حەزکەری تێکەڵاوبوون لەگەڵ خەڵکدا: *( a ~ person)* .
(٢) ڕووخۆش؛ رووکراوە. (٣) خۆش؛ تایبەتی بە کاتێکی براوەسەر بە قسەی خۆشو رابواردن لەگەڵ خەڵکدا: *( a ~ evening)* .
*n.* ئاهەنگێکی کۆمەڵایەتی ئەندامانی کڵێسەیەك یا کۆمەڵێکە.
(هەروەها " social ")

-sociableness *(n.)*; sociably *(adv.)*.

**social** (sō′shəl), *adj.* (١) کۆمەڵایەتی؛ کۆمەڵی؛ تایبەتی بە کۆمەڵ:
*( ~ life; ~ reform; ~ problems)*
(٢) کۆمەڵگایی؛ لە کۆمەڵگادا دەژی: *( Modern man is ~ .)*
(٣) تایبەتی بە چینە بەرزەکانی کۆمەڵ: *( She is a ~ climber.)*
(٤) ڕووخۆش؛ رووکراوە: *( a ~ nature)* .
(٥) بۆ یەکگرتنو کات پێکەوە رابواردن دانراوە؛ کۆمەڵایەتی: *( a ~ club)*
(٦) تایبەتی بە فەرمانبەری کۆمەڵایەتی: *( a ~ worker)* .
(٧) بە کۆمەڵ دەژین؛ کۆمەڵخواز: *( The ant is a ~ creature.)*
(٨) بە کۆمەڵ دەڕوێن (رووەکناسی). (٩) socialist .
(١٠) هی نێوان هاوپەیمانان (جەنگ).
*n.* ئاهەنگێکی کۆمەڵایەتی ئەندامانی کڵێسەیەك یا کۆمەڵێکە.
(هەروەها " sociable ").

**social climber,** خۆ نزیککەرەوە لە کەسانی پلەوپایەداری کۆمەڵ.

**social contract (**or **compact),** پەیمانی کۆمەڵایەتی: کە دەڵێت دەبێ میری بە رەزامەندی گەل فەرمانڕەوایی بکات. (فەلسەفەی " رۆسۆ ")

**social disease,** نەخۆشی جووت بوون (وەك سووزەنەكو فەرەنگی).

**social evil,** (١) شتێکە کە مەترسی بێ بۆ ئاسوودەیی کۆمەڵ (وەك هەژاری، بەنگ فرۆشتن... هتد). (٢) قەحبەیی

**socialism** (sō′shəl-iz′m), *n.* هاوبەشێتی؛ هاوبەشایەتی؛ سۆشیالیزم.

**socialist** (sō′shəl-ist), *n.* (١) سۆشیالیست؛ هاوبەشیخواز.
(٢) [S-]، ئەندامی حیزبێکی سۆشیالیستی.
*adj.* (١) سۆشیالیستی؛ تایبەتی بە بیروباوەڕی سۆشیالیستیو سۆشیالیستەکان. (٢) لایەنگری سۆشیالیزم.

**socialistic** (sō´shə-lis′tik), *adj.* سۆشیالیستی؛ سەر بە بیروباوەڕی سۆشیالیستی یا هاوبەشێتی: *( ~ ideas and programs)*

-socialistically *(adv.)*.

**socialite** (sō′shə-līt´), *n.* [Colloq.]. ئەندامێکی ناسراوی چینی تێروتەسەلو باوخوازی کۆمەڵ.

**sociality** (sō´shi-al′ə-ti), *n.* (١) (أ) ڕووخۆشێتی؛ ڕووخۆشی؛ رووکراوەیی. (ب) نموونەیەکی ئەم ڕووخۆشێتییە.
(ج) مەیلی پێکەوە ژیان لە کۆمەڵگادا.

**socialize** (sō′shə-līz´), *v.t.* (١) کردنی خانووبەرەو کۆمپانیاو کارگەو هۆی بەرهەمهێنان بە موڵکی گەل لەڕێی خستنیانە ژێردەستی میرییەوە؛ لەسەر بنچینەی سۆشیالیستی رێکخستن؛ کردن بە موڵکی هەمووکەس
(٢) گونجاندن لەگەڵ پێویستی کۆمەڵدا. (٣) فێری هەڵسانو دانیشتن کردن لەگەڵ خەڵکدا؛ فێری کۆمەڵخوازی کردن.
*v.i.* [Colloq.], بەشداربوون لە چالاکی کۆمەڵایەتیدا؛ هەڵسانو دانیشتن لەگەڵ خەڵکدا.

**socialized medicine,** چارەکردنی تەندروستی گشتی لەلایەن میرییەوە؛ گرتنە ژێردەستی چارەکردنی گشت نەخۆشان لەلایەن میرییەوە (بە بودجەی گشتی).
**socially** (sō′shəl′i), *adv.* (١) لەرووی کۆمەڵایەتییەوە:
*( ~ pleasnat)*
(٢) بەلای کۆمەڵەوە؛ بە رای کۆمەڵ: *( ~ acceptable)* .
(٣) لەناو کۆمەڵدا؛ لەرووی پلەوپایەی کۆمەڵایەتییەوە: *( ~ prominent)* .
**social register,** لیستەی ناسراوانی کۆمەڵ.
**social science,** زانستی کۆمەڵایەتی
**social scientist,** زانای کۆمەڵایەتی.
**social security,** دەستەبەری کۆمەڵایەتی.
**social service,** = social work.
**social studies,** لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی: وانەیەکی قوتابخانەیە دەربارەی پێوەندی کۆمەڵایەتی کە مێژوو و جوگرافیاو زانستی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە
**social work,** نیشوکاری کۆمەڵایەتی: بریتییە لە یارمەتیدانو خزمەتکردنی هەژاران و کەفتەکاران و لێقەوماوان.
**social worker,** کارگەری نیشوکاری کۆمەڵایەتی. (ووشەی پێشوو ببینە)
**societal** (sə-sī′ə-t'l), *adj.* کۆمەڵی؛ هی کۆمەڵ یا کۆمەڵگا:
*( ~ forces)*
**society** (sə-sī′ə-ti), *n.* (١) کۆمەڵ: کۆمەڵگا.
(٢) ناوەڵی؛ هاوەڵی؛ هاودەمی: *( I do not seek his ~ .)* .
(٣) یانە؛ کۆمەڵە؛ ڕێکخراو: *( a medical ~ )* .
(٤) چینی خۆش گوزەرانی کۆمەڵ؛ چینی بەرزو پلەوپایەداری کۆمەڵ:
*( All ~ attended the concert.)*
(٥) خووو نەریتو کاروباری ئەم چینە.
**society column,** خانەی پلەوپایەداران و ناودارانی کۆمەڵ لە ڕۆژنامەدا (کە دەنگوباسی ئەم چینە بلاودەکاتەوە).
**socio-** (sō′si-ō, sō′shi-ə), پێشگرێکە بە مانای: کۆمەڵ؛ کۆمەڵایەتی: تایبەتی بە کۆمەڵگا: *( ~ -economic)* .
**socio-economic,** کۆمەڵی- ئابووری؛ کۆمەڵی و ئابووری:
*( the ~ conditions in the country)*
**sociologist** (sō′si-ol′ə-jist, sō′shi-ol′ə-jist), *n.* کۆمەڵناس؛ زانای کۆمەڵ؛ زانای کۆمەڵناسی.
**sociology** (sō′si-ol′ə-ji, sō′shi-ol′ə-ji), *n.* کۆمەڵناسی؛ زانستی کۆمەڵ؛ زانستی کۆمەڵایەتی.
-socilogical *(adj.)*; sociologically *(adv.)*.
**sociometry** (sō′shi-om′ə-tri), *n.* هەڵسەنگاندن و پێوانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئەندامانی کۆمەڵێکی تایبەتی.
**sock** (sok), *n.* (١) پێڵاوی سووکی نووانەری شانۆنامەی قۆشمە (کۆمیدیا)ی یۆنانی و ڕۆمانی کۆن (٢) شانۆنامەی قۆشمە؛ کۆمیدیا.
(٣) گۆرەوی کورت؛ گۆرەوی پیاوانە.
**sock** (sok), *v.t.* [Slang], (١) مستەکۆڵەی قایم لێدان؛ مستەکۆڵە پیاماڵین؛ زرمە لێ هەڵسان.
(٢) خستنەناو؛ تێخستن؛ تێدادانان:
*( He ~ed all his money in the bank.)*
*n.* [Slang], مستەکۆڵە
*adv.* [Slang], ڕاستەوخۆ؛ یەکسەر
**sock it to,** [Slang]. بە توندوتیژی قسە لەگەڵ کردن؛ بە توندوتیژی لەگەڵدا جووڵانەوە؛ خەڵەتاندن و پارە زۆر لێسەندن (سەوداگەری)؛ هێرش بردنە سەر (لەهەموو ڕوویەکەوە).
**sockdolager** (sok-dol′ə-jēr), *n.* (١) شتێکی بە تیژو توندوتیژو شت بەکلاکەرەوە؛ مستەکۆڵە؛ ووتە. (٢) شتێکی زۆر زل لەچاو توخمەکەیدا.
**socket** (sok′it), *n.* چاڵێک یا بۆشاییەکە کە شتێکی تێ دەخرێت یا تێخراوە (وەک چاڵی ئێسکی کلۆت، ئەو چاڵاییەی گڵۆپی تێ دەخرێت یا پلاکی کارەبای تێ دەخرێت، چاڵی چاو...هتد).
*v.t.* چاڵی وەها بۆ کردن؛ خستنە چاڵ یا بۆشایی وەهاوە.
**sock-eye** (sok′ī′), *n.* سەلموونی سوور: جۆرێکە لە ماسی.
**socle** (sok′'l, sō′k'l), *n.* بنی دەرپۆقیوی پایەو دیوارو پەیکەر.
**Socratic** (sō-krat′ik), *adj.* سوقراتی؛ تایبەتی بە فەلسەفەی سوقرات.
*n.* (١) قوتابی سوقرات. (٢) فەیلەسوفی یۆنانی پەیڕەوکەری سوقرات
**sod** (sod), *obsolete past tense of* seethe.
**sod** (sod), *n.* (١) چیمەن (٢) چینی سەرەوەی خاک بە چیمەنەکەیەوە.
(٣) پارچەیە لەم خاکو چیمەنە. (٤) خاکی نیشتمان؛ نیشتمان.
*v.t.* داپۆشینی خاکی ڕووت بە چینێکی تەنک لە خاکو چیمەن (کە وەک بەرە بەسەریدا ڕا دەخرێو دەستبەجێ وەک چیمەن دەنوێنێ لە شوێنە تازەکەدا).
**under the sod,** لە گۆڕدایە؛ نێژراوە؛ مردووەو لەژێر خاکدایە.
**sod** (sod), *n.* [British Slang], کەسێکی بێ نرخ؛ کەسێکی خوێڕیو بۆگەن.
**soda** (sō′də), *n.* (١) کاربۆناتی سۆدیۆم. (٢) بیکاربۆناتی سۆدیۆم؛ سۆدەی نان. (٣) هایدرۆکسایدی سۆدیۆم.
(٤) ئاوی گازاوی یا کەفوکوڵدار.
(٥) سۆدە: خواردنەوەیەکە لە ئاوی کەفوکوڵاوی و شیلە دروست دەکرێ.
**soda ash,** کاربۆناتی سۆدیۆمی ناپوخت.
**soda fountain,** (١) فرۆشگای سۆدەو خواردنەوەی گازاوی تر.
(٢) دەفری بەلووعەداری سۆدە.
**soda jerk,** کارگەری فرۆشگای سۆدەو خواردنەوەی گازاوی تر.
**sodality** (sō-dal′ə-ti), *n.* (١) دۆستایەتی؛ هاودەمی؛ ناوەڵێتی.
(٢) کۆمەڵە؛ یەکێتی. (٣) کۆمەڵەی کاسۆلیکی.
**soda pop,** سۆدە: خواردنەوەیەکە لە ئاوی گازاوی و شیرینی و تامی دەستکرد پێکدێت لە قوتودا دەفرۆشرێ.
**soda water,** ئاوی سۆدە؛ ئاوی گازاوی (بە تەنها دەخورێتەوە یا تێکەڵاوی خواردنەوەی مەستکەر دەکرێ).
**sodden** (sod′'n), *obsolete past participle of* seethe.
*adj.* (١) خووساو؛ تێراو: *(the ~ ground)* .
(٢) هەویراوی؛ نەبرژاو (نان، بسکویت): *( ~ biscuits)* .
(٣) گێژوویژ (لە مەستیدا)؛ وور؛ حۆل (لەبەر سەرخۆشی).
(٤) بێ مێشک؛ گەمژە؛ گەلحۆ؛ دەبەنگ: *( ~ minds)* .
(٥) [Archaic]، کوڵاو.
*v.t.* خووساندن؛ تێراوکردن؛ زۆر تەڕکردن.
*v.i.* خووسان؛ تێراوبوون؛ زۆر تەڕبوون.
**sodium** (sō′di-əm), *n.* سۆدیۆم (کیمیا).
**sodium bicarbonate,** = baking soda.
**sodium bromide,** برۆمیدی سۆدیۆم: ئاوێتەیەکی سپی بلوورییە لە دەرمان و وێنەکاریدا بەکاردێت (کیمیا).
**sodium carbonate,** کاربۆناتی سۆدیۆم (کیمیا)؛ سۆدەی شتن.
**sodium chlorate,** کلۆراتی سۆدیۆم (کیمیا).
**sodium chloride,** کلۆریدی سۆدیۆم؛ خوێ.
**sodium hydroxide,** سۆدەی داخکەر.
( پێشی دەووترێ " sodium hydrate " وە " caustic soda " ).
**sodium nitrate,** نیتراتی سۆدیۆم (کیمیا).
**Sodomite** (sod′əm-īt′), *n.* (١) نیشتەجێیەکی شاری " Sodom "ی فەلەستینی کۆن (کە خوا وێرانی کرد لەبەر بێناموسی خەڵکەکەی)
(٢) [S-]، نێرباز؛ هەتیوباز؛ نێرگێ.
**sodomy** (sod′əm-i), *n.* نێرگایین؛ نێربازی؛ هەتیوبازی؛ ووڵاخ گایین؛ گیانەوەر گایین.
**soever** (sō-ev′ēr), *adv.* (١) هەرچۆنێک بێت؛ تا هەر ڕادەیەک بێت:
*( how dark ~ the night may be)*
(٢) بە هیچ جۆرێک؛ هیچ: *( no rest ~ )* .

**-soever** (sō-ev′ẽr), پاشگرێکە بە مانای: هەر؛ هیچ؛ بە هیچ.
**sofa** (sō′fə), *n.* قەنەفە
**sofa bed,** قەنەفەی چەرپایەیی: قەنەفەیەکە دەکرێتەوە بۆ لەسەر نووستن وەك چەرپایە
**soffit** (sof′it), *n.* دیوی ژێرەوەی گوێ سەبانەو پێ پلیکانەو تاق.
**soft** (sôft), *adj.* (١) (ا) نەرم؛ نەرمونۆڵ؛ شل. (ب) فشەڵ؛ فش‌وفۆڵ؛ فش.
(٢) نەرم؛ بە ئاسانی دەبڕدرێتەوە: *( ~ wood)* .
(٣) نەرم؛ شل: *( ~ butter)* .
(٤) ساف‌ولووس: *( a ~ skin)* .
(٥) ترش‌و توون‌و تاڵ‌و تیژ نییە.
(٦) مەست نەکەر؛ ئاکحولی: *( ~ drinks)* .
(٧) سازی (ئاو): *( ~ water)* .
(٨) لەسەرخۆ؛ هێواش؛ نەرم: *( a ~ breeze)* .
(٩) ئاسك (مرۆڤ)؛ بەرگەی هیچ ناگرێ؛ شلەپەتێ: *( a ~ man)* .
(١٠) ئاسان؛ سووك: *( a ~ job)* .
(١١) (ا) هێمن؛ لەسەرخۆ. (ب) دڵ نەرم؛ نەرم (سرووشت): *( a ~ heart)* .
(ج) بوودەڵە؛ بێ هێز.
(د) [Colloq.]، ساویلکە؛ مێشك سووك: *( ~ in the head)* .
(١٢) بە زێڕ پشتیوانی نەکراو (پارە، سکە).
(١٣) (ا) شەوقەکەی ئازاری چاو نادات؛ نەرم؛ زەق نییە (ڕەنگ)؛ کز:
*( a ~ light, color, etc.)*
(ب) هێواش؛ نرم؛ ساز (دەنگ): *( ~ music; a ~ voice)* .
(١٤) نەرم (وەك دەنگی "س" وە "ج") (دەنگناسی):
*( C is ~ in " city " but hard in " cat ".*
*G is ~ in " German " but hard in " get ".)*
(١٥) فشەڵ؛ فش؛ فشۆڵ:
*( His support among the people is very ~ .)*
*adv.* بەهێواشی؛ لەسەرخۆ؛ بە ئەسپایی.
*n.* شتێکی نەرم؛ بەشێك یا ئەندامێکی نەرم.
*interj.* [Archaic], (١) بێ دەنگ بە!، قسە مەکە!.
(٢) هێواش کە!؛ بووەستە!.
**soft-ball** (sôft′bôl′), *n.* (١) جۆرێکە لە یاری تۆپ تۆپێن (بە تۆپێکی نەرم دەکرێ‌و بە دەس دەهاوێژرێ). (٢) تۆپە نەرمەکەی ئەم یارییە.
**soft-boiled** (sôft′boild′), *adj.* دەڵەمە (هێلکە)؛ کەم کوڵاو (هێلکە):
*( ~ eggs)*
**soft coal,** = bituminous coal.
**soft drink,** ساردەمەنی؛ خواردنەوەی ناکحوولی.
**soften** (sôf′′n), *v.t.* (١) نەرم کردن؛ فشەڵ کردن؛ نەرمونۆڵ کردن؛ شل کردنەوە. (٢) هێمن کردنەوە؛ لە توندوتیژی کەم کردنەوە.
(٣) ( ~ up)، بەرهەڵستی کەم کردنەوە؛ بێ هێز کردن (سوپا).
*v.i.* نەرم بوون؛ فش بوون؛ شل بوونەوە.
-softener *(n.)*.
**soft goods,** = dry goods.
**soft-head** (sôft′hed′), *n.* کەسێکی بێ مێشك؛ کەسێکی ساویلکە، گێل یا گەلحۆ
**soft-headed** (sôft′he′did), *adj.* بێ مێشك؛ ساویلکە؛ گێل؛ گەلحۆ.
**soft-hearted** (sôft′här′tid), *adj.* دڵنەرم؛ بەبەزەیی؛ هاوسۆز.
**softie** (sôf′ti), *adj.* - softy.
**softish** (sôf′tish), *adj.* نەختێك نەرم.
**softly** (sôft′li), *adj.* بە هێواشی؛ بە ئەسپایی؛ بە نەرمی؛ بە بێ دەنگ؛ بە بێ خشپە؛ بە هێمنی؛ لەسەرخۆ.
**softness** (sôft′nis), *n.* نەرمی؛ نەرمونۆڵی؛ فشەڵی؛ هێواشی؛ دەنگ کزی؛ ناتوندوتیژی
**soft palate,** ئاسمانەی نەرمی دەم؛ مەلاشوو؛ دوا مەلاشوو (پێشی دەووترێ " velum ")

**soft pedal,** (١) پایدەری دەنگ کزکردنی پیانۆ.
(٢) کپکەرەوە (ئامێر)؛ خامۆشکەر.
**soft-pedal** (sôft′ped′′l), *v.t.* (١) دەنگی پیانۆ کزکردن بە پایدەر.
(٢) لە توندوتیژی کەمکردنەوە؛ بە هێمنی‌و لەسەرخۆیی پێشکەش کردن
*( to ~ an issue)*
**soft sell,** [Colloq.], شت فرۆشتن بەبێ هەڵپێچان‌و بەگیرهێنانی کڕیارەکە.
**soft-shell** (sôft′shel′), *adj.* قاووغ نەرم (قرژانگ)
*n.* قرژانگی قاووغ نەرم
**soft-shelled** (sôft′sheld′), *adj.* قاووغ نەرم.
**soft-shelled crab,** قرژانگی قاووغ نەرم
**soft-shelled turtle,** کیسەڵی ئاوی قەڵغان نەرم.
**soft-shoe** (sôft′shōō′), *n.* نەرمە پێڵاو: پێڵاوێکی بێ نالچەیە بۆ سەمای " tap dance "
**soft shoulder,** قەراغی قیرتاو نەکراوو نەرمی ڕێگەوبان.
**soft-soap** (sôft′sōp′), *v.t.* (١) سابوونی نەرم لێدان
(٢) [Colloq.]: مەرایی؛ قسە مێچکە بۆ کردن.
**soft soap,** (١) سابوونی نەرم.
(٢) [Colloq.]، مەرایی؛ قسە مێچکە.
**soft-spoken** (sôft′spō′k'n), *adj.* (١) (ا) هێمن؛ لەسەخۆ؛ قسە نەرم. (ب) بە هێمنی‌و نەرمی ووتراو.
(٢) قسە خۆش؛ زمان شیرین؛ قسەزان.
**software** (sôft′wâr′), *n.* بەرنامە یا پرۆگرامی کۆمپیوتەر:
*( computer ~ )*
**soft-wood** (sôft′wood′), *n.* (١) داری نەرم؛ دارو تەختەی بە ئاسانی بڕاوە (وەك کاژ). (٢) درەختی دار نەرم (وەك کاژ یا سنەوبەر)
**softy, softie** (sôf′ti), *n.* [Colloq.], (١) کەسێکی زۆر دڵنەرم‌و بەسۆز. (٢) کەسێکی بوودەڵەو سەرژنانی؛ شلەشاری؛ کوونی
**soggy** (sog′i), *adj.* (١) (ا) خووساو؛ زۆر تەڕ؛ تێراو: *( a ~ lawn)* .
(ب) بڵ (چێشتی برنج)؛ هەویراوی؛ نەبرژاو: *( ~ bread)*
(٢) قورس‌و ووشك‌و ناخۆش (نووسراو): *( ~ prose)* .
-soggily *(adv.)*; sogginess *(n.)*.
**soigné** (swâ′nyā′), *adj.* [Fr.], (١) جوان‌و ڕێك‌وپێك‌و باش ڕاگیراو:
*( a ~ restaurant)*
(٢) تەڕپۆش؛ شۆخ؛ ڕێك‌وپێك. (هەروەها " soignée " بۆ مێ ).
**soil** (soil), *n.* (١) خاك؛ گڵ؛ خۆڵ؛ چینی سەرەوەی زەمین کە شتی تێدا دەڕوێ. (٢) جۆری خاك یا زەوی (ڕووتەنی، خاکی لماوی...هتد):
*( sandy ~ ; barren ~ )*
(٣) نیشتمان؛ خاك؛ وڵات: *( native ~ ; foreign ~ )* .
(٤) زەوی؛ کشتوکاڵ؛ زەوی‌و ژیانی کشتوکاڵی: *( a man of the ~ )*
(٥) شوێن یا دۆخی باش بۆ شت پەروەردەکردن: *( a breeding ~ )* .
**soil** (soil), *v.t.* (١) پیس کردن (بەتایبەتی دیوی دەرەوە یا ڕووی شت)؛ لەکەدارکردن؛ لەکەلێدان (٢) ڕیسواکردن؛ ناوزڕاندن؛ ناوشکاندن؛ ناوبانگ پیس کردن. (٣) ئابڕووبردن؛ دامێن پیس کردن؛ ناموس شکاندن.
*v.i.* پیس بوون؛ لەکەداربوون؛ ناوزڕان؛ ناموس چوون.
*n.* (١) پیسی؛ پیس بوون. (٢) لەکە؛ پەڵە. (٣) ناموس چوون؛ ئابڕووچوون
(٤) شیاکە؛ پەین. (٥) گوو؛ پیسایی؛ پیسی؛ گووراو.
**soil** (soil), *v.t.* (١) قەرسیل دان بە مەڕومالات.
(٢) ئاو سکی مەڕومالات پاکردنەوە بە قەرسیل.
**soilage** (soil′ij), *n.* قەرسیل (کە دەدرێ بە مەڕومالات).
**soil pipe,** بۆری پیسایی ئاودەست.
**soilure** (soil′yoor), *n.* (١) پیس کردن؛ پیس بوون؛ لەکەدارکردن.
(٢) لەکە؛ پەڵە؛ پیسی.
**soiree, soirée** (swä-rä′), *n.* ئاهەنگی شەو.
**sojourn** (sō′jŭrn), *v.i.* نیشتەجێ بوون بۆ سەردەمێك؛ لە شوێنێك

ژیان یا مانەوە بۆ سەردەمێك

**n.** نیشتەجێیی سەردەمی؛ ژیان یا مانەوەی سەردەمی لە شوێنێکدا.

-sojourner *(n.)*.

**soke** (sōk), ***n.*** (١) مافی دادپرسین لە ناوچەیەکدا.

(٢) ئەو ناوچەیەی دادگایەك مافی دادپرسینی تێدا هەیە.

**Sol** (sol), ***n.*** (١) خۆر؛ ڕۆژ. (٢) خودای خۆر لای ڕۆمانە کۆنەکان.

(٣) زێر؛ ئاڵتوون

**sol** (sōl), ***n.*** پارەی وولاتی " پیرۆ " یە.

**solace** (sol′is), ***n.*** دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنەوایی کردن؛ دڵنەوایی.

***v.t.*** (١) دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنەوایی کردن. (٢) کەمکردنەوە.

**solar goose,** = gannet.

**solar** (sō′lẽr), ***adj.*** (١) خۆری؛ ڕۆژی؛ تایبەتی بە خۆر.

(٢) لە خۆرەوە پەیدابوو؛ خۆری؛ هی خۆر: ***( ~ energy)*** .

(٣) لە تیشکی ڕۆژەوە دێت؛ هەتاوی: ***( ~ heating)*** .

(٤) لەسەر سوڕانەوەی زەمین بە دەوری ڕۆژدا دەپێوری: ***( ~ day)***

**solar day,** ڕۆژی بیستوچوار ساتی (لە نیوەڕۆوە بۆ نیوەڕۆ یا لە نیوەشەوەوە بۆ نیوەشەو)

**solar house,** خانووی هەتاوی: خانوویەکە ڕووی دەرەوەی زۆری شووشەیە بۆ سوود لە تیشکی هەتاو وەرگرتن لە گەرم کردنی خانووەکەدا.

**solarium** (sō-lâr′i-əm), ***n.*** ژووری هەتاو؛ ژووری ڕوو لە خۆر؛ ژوورێکە هەتاوی زۆر تێ بکەوێ بۆ چارەکردنی نەخۆشی وەك لە خەستەخانەدا.

**solarize** (sō′lə-rīz′), ***v.t.*** (١) دانەبەر تیشکی خۆر؛ هەتاولێدان.

(٢) زیاتر لە پێویست دانەبەر تیشکی ڕۆژ (وێنە)

-solarization *(n.)*.

**solar plexus,** (١) هەستە دەماری بەشی سەرەوەی گەدە.

(٢) [Colloq.] لاسەرووی گەدە؛ دەمی گەدە.

**solar system,** کۆمەڵەی خۆر: خۆرو هەموو ئەو ئەستێرانەی بەدەوریدا دەسووڕێنەوە.

**solar year,** ساڵی خۆری (کە ٣٦٥ ڕۆژە)

**solatium** (sō-lā′shi-əm), ***n.*** دڵهێنانەوە جێی خۆی؛ دڵنەوایی دوای هەست بریندارکردن

**sold** (sōld), *past tense and past participle of* sell.

**solder** (sod′ẽr), ***n.*** (١) داڕێژە یا داڕشتەی لەحیم

(٢) بەند؛ پەیوەندی؛ پەیوەست؛ پێبەست

***v.t.*** (١) لەحیم کردن (٢) پەیوەستکردن؛ کردن بە یەك؛ پێکەوەبەستن.

***v.i.*** (١) لەحیم بوون (٢) یەکگرتن؛ بوون بە یەك؛ پەیوەست بوون.

-solderer *(n.)*.

**soldier** (sōl′jẽr), ***n.*** (١) سەرباز (٢) کەسێکە کە لە سوپادا بێ سەرباز یا ئەفسەر (٣) کەسێکە کە بۆ سەرکەوتنی مەسەلەیەك تێدەکۆشێت.

(٤) مێروولەی سەرباز: مێروولەیەکی بەهێزە وەك سەرباز شارە مێروولەکە دەپارێزێ

***v.i.*** سەربازی کردن.

***v.t.*** (١) سەربازی کردن (٢) خۆ لە ئیشوکار دزینەوە (بە بیانووی نەخۆشی و شتی وەهاوە)؛ بە درۆ ئیش کردن یا خۆ نەخۆش خستن.

**soldierly** (sōl′jẽr-li), ***adj.*** سەربازانە؛ بە شێوەیەك کە لە سەرباز بێت؛ نازایانە

**soldier of fortune,** سەربازی بە کرێ گیراو

**soldiery** (sōl′jẽr-i), ***n.*** (١) سەربازگەل؛ سەربازان.

(٢) دەستەیەك سەرباز؛ تاقمە سەرباز. (٣) زانستی سوپایی.

**soldo** (sol′dō), ***n.*** پارەیەکی کەم نرخی ئیتاڵییە.

**sole** (sōl), ***n.*** (١) بنی پێ؛ بن پێ؛ بنی قاچ؛ بەری پێ.

(٢) بنە پێڵاو؛ بنی پێڵاو (٣) بنی هەندێ شت (وەك گۆرزی یاری گۆلف، هەوجار... هتد)

***v.t.*** (١) بن تێگرتن (بەتایبەتی بنی تازە)

(٢) بنی گۆرزی گۆلف خستنەسەر زەوی لە کاتی ئامادەبووندا بۆ لێدانی تۆپەکە.

**sole** (sōl), ***adj.*** (١) تەنها؛ تاقە کەس:

*( She is her parents' ~ survivor.)*

(٢) هەر؛ تایبەتی بە کەسێك؛ دەزگایەك؛ یا شتێك؛ تەنها؛ تاك.

*( The Court has the ~ right to decide.)*

(٣) [Archaic]؛ بێ کەس؛ تەنها خۆ؛ تەنیا؛ کەسی لە دەور نییە.

(٤) شوونەکردوو.

**sole** (sōl), ***n.*** جۆرێکە لە ماسی.

**solecism** (sol′ə-siz′m), ***n.*** (١) بە هەڵە زمان بەکارهێنان (بەتایبەتی هەڵەی ڕێزمانی). (٢) لە سنووری ڕەووشت و نەریتی جوان دەرچوون؛ بێ ئەزاکەتی. (٣) هەڵە

-solecist *(n.)*; solecistic *(adj.)*.

**solely** (sōl′li), ***adv.*** (١) بە تەنها؛ بە تاقی تەنیا:

*( She went ~ on her way.)*

(٢) هەر؛ تەنها هەر؛ بە تەنها: ***( We are ~ to blame.)*** .

(٣) تەنها؛ بەتەواوی؛ هەر: ***( He reads ~ for enjoyment.)***

**solemn** (sol′əm), ***adj.*** (١) پیرۆز: ***( a ~ oath)*** .

(٢) بەشکۆ؛ بە توند گیراو؛ شکۆدار: ***( a ~ occasion, ceremony, etc.)***

(٣) سەنگین؛ مۆن؛ مەنگ: ***( a ~ face)*** .

(٤) دڵتەنگکەر؛ ڕەش؛ ترسناك؛ دڵگیر.

-solemnly *(adv.)*; solemness *(n.)*.

**solemnify** (sə-lem′nə-fī′), ***v.t.*** شکۆپێدان؛ پیرۆزکردن.

**solemnity** (sə-lem′nə-ti), ***n.*** (١) شکۆ؛ بەشکۆیی:

*( the ~ of the occasion)*

(٢) ڕووداوێکی بەشکۆو بڵند.

(٣) سەنگینی؛ مەنگی.

**solemnize** (sol′əm-nīz′), ***v.t.*** (١) یادکردنەوە بە پێی نەریت (بەتایبەتی شتێکی ئاینی پیرۆز).

(٢) پیرۆزکردن بە پێی نەریتی ئاینی و کۆمەڵایەتی:

*( to ~ a marriage; The marriage was ~d.)*

(٣) شکۆپێدان؛ سەنگین کردن.

-solemnization *(n.)*.

**solenoid** (sō′lə-noid′), ***n.*** تەلی مارپێچی ئەلەکتریکی موگناتیساوی.

-solenoidal *(adj.)*.

**solfa** (sōl′fä′), ***n.*** (١) سۆلفا: برگەکانی کێشەی ئاوازی مۆسیقا کە بریتین لەمانە: do, re, mi, fa, sol, la, ti .

(٢) بەکارهێنانی ئەم برگانە لە مۆسیقالێدان و گۆرانی ووتندا.

***v.t. & v.i.*** مۆسیقالێدان و گۆرانی ووتن بەپێی برگەکانی کێشەی مۆسیقا.

-solfatist *(n.)*.

**solfatara** (sōl′fä-tä′rä), ***n.*** کون یا درزێکی ئاگرپژێنییە کە هەڵمو گازی گۆگردی لێوە دێتەدەرێ.

**solfeggio** (sol-fej′ō, sol-fej′i-ō), ***n. Also*** **solfége,** (١) مەشقی گۆرانی بەپێی " سۆلفا " (ووشەی پێشوو ببینە).

(٢) " سۆلفا " بەکارهێنان لە گۆرانی خوێندنەوە یا ووتندا.

**solicit** (sə-lis′it), ***v.t.*** (١) داوالێکردن؛ لێ پاڕانەوە؛ تکالێکردن:

*( We ~ your support.; He ~ed them for help.)*

(٢) هاندان بۆ کاری خراپەکردن (بەتایبەتی کاری بەدڕەووشتی یا قەدەغە)؛ تەفرەدان؛ فریودان. (٣) داوای گان لێکردن (بەتایبەتی کە قەحبەیەك داوا لە پیاو بکات)؛ داوای چوونە جێ کردن لەگەڵدا.

***v.i.*** داواکردن؛ پاڕانەوە؛ تکاکردن.

**solicitation** (sə-lis′ə-tā′shən), ***n.*** (١) داوا؛ تکا؛ پاڕانەوە؛ خواست؛ داواکاری؛ داواکردن. (٢) تەفرە؛ هاندانی کاری خراپە؛ فریودان.

**solicitor** (sə-lis′ə-tẽr), ***n.*** (١) داواکار (پارەمەتی، شت کڕین و فرۆشتن... هتد)؛ دەڵاڵ؛ داواکەر. (٢) پارێزەر (لە ئینگلتەرە).

(٣) پارێزەری شار یا دەسگایەکی میری؛ ڕابەری یاسایی میری.

**solicitor general,** پارێزەری گشتی میری؛ ڕابەری یاسایی گشتی

میری.

**solicitous** (sə-lis′ə-təs), *adj.* (١) بەدەربەست؛ بەتەنگەوەهاتوو:
***( He was ~ of his employees' welfare.)***
(٢) بەپەرۆش؛ حەزپێکەر: ***( She was ~ to make friends.)*** .
(٣) بەمەراق؛ مەراقدار؛ خەمخۆر؛ بەخولیا؛ دڵەڕاوکێیەتی:
***( to be ~ about one's health)***

**solicitude** (sə-lis′ə-to͞od′, sə-lis′ə-tūd′), *n.* (١) نیگەرانی؛ نڤد
بەتەنگەوەهاتن؛ زۆر بەدەربەستەوەبوون. (٢) (*pl.*) هۆی مەراق؛ دڵەڕاوکێ؛ خەم؛ دڵەلەرزێ؛ بەپەرۆشەوەبوون.

**solid** (sol′id), *adj.* (١) توندوتۆڵ؛ نەرم یا شل نییە؛ توند:
***( When water becomes ~ , we call it ice.)***
(٢) ڕەق؛ پتەو؛ بۆش نییە؛ سەخت: ***( A bar of iron is ~ .)*** .
(٣) پتەو؛ قایم: ***( a ~ foundation; to be on ~ ground)*** .
(٤) پوخت: شتی گەندی تێکەڵاو نەکراوە؛ ساغ: ***( ~ gold)*** .
(٥) بەهێز؛ پتەو؛ چەسپاو:
***( a ~ building; ~ arguments; a ~ business firm)***
(٦) گشتی؛ هەموو؛ بەش بەش نەکراو: ***( a ~ vote for peace)*** .
(٧) تەندار (ئەندازە)؛ قەبارەدار: ***( a ~ figure; ~ geometry)*** .
(٨) تەواو؛ بەبێ کەموکووڕی: ***( ~ satisfaction)*** .
(٩) یەك پارچە؛ پچڕپچڕ نییە: ***( a ~ line of fortification; " Everyman " is a ~ word.)***
(١٠) بەردەوام؛ بەبێ وەستان: ***( He talked for two ~ hours.)*** .
(١١) یەك ڕەنگ؛ سادە (قوماش): ***( The fabric is ~ red.)*** .
(١٢) سفت (١٣) چڕ: ***( ~ fog)*** .
(١٤) ڕاستەقینە. (١٥) [Colloq.]، پشت پێ بەستراو.
(١٦) باش و پتەو و سەرکەوتوو؛ چەسپیو: ***( a ~ relationship)*** .
(١٧) [Slang]، زۆر باش و سەرکەوتوو: ***( a ~ dance band)*** .
*n.* (١) شتێکی توندوتۆڵ یا پتەو؛ شتێکی چەسپیو.
(٢) شتێکی تەندار (ئەندازە)؛ شێوەیەکی بە قەبارە یا بەرجەستە.
**-solidly** ***(adv.)***; **solidness** ***(n.).***

**solid angle,** گۆشەی تەندار؛ گۆشەی بە قەوارە.

**solidarity** (sol′ə-dar′ə-ti), *n.* پشتگیری؛ کۆمەك؛ یەککەوتن؛ یەکگرتن؛ یەکێتی؛ هاوکاری.

**solid geometry,** ئەندازەی تەندار.

**solidify** (sə-lid′ə-fī′), *v.t.* پتەوکردن؛ چەسپاندن؛ یەك پێگرتن.
*v.i.* پتەوبوون؛ چەسپان؛ جێگیربوون؛ یەکگرتن؛ بەستن (ئاو)؛ یەك بەستن.
**-solidification** ***(n.).***

**solidity** (sə-lid′ə-ti), *n.* (١) پتەوی؛ سەختی؛ قایمی؛ چەسپان.
(٢) دروستی (دارایی، ڕەووشت، مێشك)؛ ساغ و باشی؛ پتەوی؛ بێ کەموکووڕی.

**solidus** (sol′i-dəs), *n.* (١) پارەیەکی زێڕی ڕۆمانی کۆنە.
(٢) هێڵی لار ( / ) (وەك ئەوەی ڕۆژو مانگ و ساڵ جیادەکاتەوە لە بەرواردا ).

**soliloquist** (sə-lil′ə-kwist), *n.* خۆدوێنەر؛ خۆدوێن؛ لەگەڵ خۆ گفتوگۆکەر.

**soliloquize** (sə-lil′ə-kwīz′), *v.i.* لەبەر خۆوە وتن؛ خۆ دوواندن؛ لەگەڵ خۆ گفتوگۆ کردن (لەسەر شانۆ)؛ بە خۆ وتن.

**soliloquy** (sə-lil′ə-kwi), *n.* (١) خۆ دووان؛ لەگەڵ خۆ گفتوگۆکردن (لەسەر شانۆ). (٢) گفتوگۆی لەگەڵ خۆدا کراو (شانۆنامە)؛ وتەی کەسێکی شانۆنامە کە بە تەنها لەسەر شانۆ لەبەر خۆیەوە دەیڵێت و هەست و ئەستی خۆی بۆ گوێ گرەکان تێدا دەردەخات.

**solipsism** (sol′ip-siz′m), *n.* (١) بیروباوەڕێکی فەلسەفییە کە دەڵێت مرۆڤ دەتوانێ تەنها هەر هەست بە بەسەرهاتی خۆی بکات و هیچی تر.
(٢) بیروباوەڕێکی فەلسەفییە کە دەڵێت تەنها شت کە لە ڕاستیدا هەبێ هەر کیانی مرۆڤ خۆیەتی.
**-solipsist** ***(n.).***

**solitaire** (sol′ə-târ′, sol′ə-târ′), *n.* (١) گۆشەنشین؛ گۆشەگیر؛ ووشکەسۆفی. (٢) تاقە ئەڵماسی ئەموستیلە.
(٣) یارییەکی کاغەزی یەك کەسییە.

**solitary** (sol′ə-ter′i), *adj.* (١) تەنیا؛ تەنها؛ تاك و تەنیا.
(٢) تەنها یەکێك؛ تاك: ***( a ~ case of measles)*** .
(٣) هی تەنیایی؛ هەست بە تەنیایی کەر؛ تەنیا (هەست): ***( a ~ life)*** .
(٤) چۆڵ؛ چەپە؛ دوورە دەست: ***( a ~ place)*** .
(٥) بە تەنیا کراو.
*n.* (١) کەسێکی گۆشەگیر؛ ووشکە سۆفی.
(٢) solitaryconfinement .

**solitary confinement,** زیندانی کردنی تەنیایی؛ بەندکردن بە تەنیا.

**solitude** (sol′ə-to͞od′, sol′ə-tūd′), *n.* (١) تەنیایی؛ ژیانی تەنهایی؛ گۆشەگیری. (٢) شوێنێکی چۆڵ و دوورە دەست.

**sollcret** (sol′ēr-et, sol′ēr-et′), *n.* پێڵاوزرێ (کە بەشێکە لە قەڵغانی کۆن)؛ پێڵاوی ئاسن.

**solmization** (sol′mī-zā′shən), *n.* بەکارهێنانی بڕگەکانی کێشەی مۆسیقا لە مۆسیقالێدان و گۆرانی وتندا. (ووشەی " **solfa** " ببینە).

**solo** (sō′lō), *n.* (١) پارچەیەك مۆسیقا یا گۆرانییەکی یەك کەسی.
(٢) فڕینی فڕۆکەوان بە تەنیا. (٣) خۆنوواندنێکی تەنیا (سەما، شانۆنامە، مۆسیقا ...هتد)؛ کارێکی تاکەکەسی. (٤) یاری کاغەزی تاکەکەسی
*adj.* تەنیا (مۆسیقا، گۆرانی، سەما، فڕین، شانۆ... هتد)؛ بە تەنها کراو:
***( a ~ flight in an airplane; a ~ performance)***
*adv.* بە تەنیا (فڕین، خۆنوواندن...هتد): ***( to fly ~ )*** .
*v.i.* بە تەنها فڕینی فڕۆکەوان (بەتایبەتی کە یەکەم جاری بێت بەبێ مامۆستا).

**soloist** (sō′lō-ist), *n.* کەسێکە کە بە تەنیا کارێك دەکات بەتایبەتی: (ا) گۆرانی بێژ یا مۆسیقاژەنی تەنیا. (ب) فڕۆکەوانێکە کە بە تەنیا بفڕێ بەبێ کەس.

**so long,** [Colloq.], = **good-by.**

**solstice** (sol′stis), *n.* گەڕانەوەی ڕۆژ (لە زستان و هاویندا)؛ خۆرگەڕانەوە: ***( summer ~ ; winter ~ )*** .

**solstitial** (sol-stish′əl), *adj.* (١) هی ڕۆژگەڕانەوە (بەتایبەتی هی هاوین). (٢) لە کاتی ڕۆژگەڕانەوەدا ڕوودەدات.

**solubility** (sol′yoo-bil′ə-ti), *n.* (١) توانای توانەوە؛ توانەوە بۆ بوون. (٢) چەندی یا هێندی شتێك کە لە هەندێکی تایبەتی شلەدا دەتوێتەوە.

**soluble** (sol′yoo-b'l), *adj.* (١) دەتوێتەوە؛ بۆی هەیە بتوێتەوە:
***( Sugar is ~ in water.)***
(٢) چارەسەر دەکرێ؛ چارە دەکرێ؛ لێکدەدرێتەوە:
***( a ~ puzzle, problem, etc.)***
**-solubleness** ***(n.)***; **solubly** ***(adv.).***

**solute** (sol′ūt, sō′lo͞ot), *n.* ماددەی تواوە.
*adj.* (١) تواوە. (٢) جیا (ڕووەکناسی).

**solution** (sə-loo′shən, sə-lū′shən), *n.* (١) چارەسەرکردن؛ چارەکردن؛ لێکدانەوە.
(٢) چارەسەر؛ چارە: ***( the ~ of a problem, mystery, stc.)*** .
(٣) تواندنەوە. (٤) توانەوە.
(٥) گیراوە؛ ئاووك؛ شلاووك: ***( a ~ of sugar and water)*** .
(٦) هەڵوەشانەوە؛ پارچەپارچەبوون؛ لێکجیابوونەوە؛ دوایی پێ هاتن.

**solvable** (sol′və-b'l), *adj.* (١) چارەسەر دەکرێ؛ چارەی هەیە.
(٢) دەتوێتەوە؛ هەڵدەوەشێنرێتەوە؛ دوایی پێ دەهێنرێت.
**-solvability** ***(n.).***

**solve** (solv), *v.t.* (١) چارەسەرکردن؛ چارەکردن؛ هەڵهێنان (مەتەڵ):
***( to ~ a problem, puzzle, etc.)***
(٢) لێکدانەوە (کێشەی بیرکاری یا ژمارەو پێوان).

**solvency** (sol′vən-si), *n.* (١) توانابوونی قەرزدانەوە؛ سەرمایە زیاتر هەبوون لە قەرز. (٢) توانای شت تواندنەوە (ناو، شلە).
**solvent** (sol′vənt), *adj.* (١) توانای هەیە هەموو قەرزێکی بداتەوە؛ سەرمایەی زیاترە لە قەرز: *( The company is ~ .)* .
(٢) توانای شت تواندنەوەی هەیە؛ دەتوێنێتەوە؛ توێنەرەوە.
*n.* (١) شلەی توێنەرەوە. (٢) چارەسەر؛ چارە؛ چارەکەر.
**soma** (sō′mə), *n.* لەش؛ تەن.
**Somali** (sō-mä′li, sə-mä′li), *n.* (١) هاوولاتییەکی سۆمال.
(٢) زمانی سۆمالییەکان.
**somatic** (sō-mat′ik), *adj.* (١) لەشی؛ تەنی؛ تایبەتی بە لەش.
(٢) هی دیواری دەرەوەی لەش نەك هەناو؛ هی چوارچێوەی تەن.
**somatic cell,** خانەی لەشی (بۆ جیاکردنەوەی لە خانەی زاووزێ " germ cell ").
**somato-** (sō′mə-tō, sō′mə-tə), *Also* somat-, پێشگرێکە بەمانای: لەشی؛ تایبەتی بە لەش: *( somatology)* .
**somatology** (sō′mə-tol′ə-ji), *n.* (١) لەشناسی؛ زانستی لەش (هی هەموو زیندەوەر). (٢) لەشی مرۆڤ ناسی؛ زانستی لەشی مرۆڤ (کە یەکێکە لە زانستی مرۆڤ).
-somatologic; somatological *(adj.).*
**somatoplasm** (sō′mə-tə-plaz′m), *n.* (١) پرۆتۆپلازمی خانەی لەش. (٢) خانەی لەش.
**somatopleure** (sō′mə-tə-ploor′), *n.* دیواری لەش (ناولەمەناسی).
**somber, sombre** (som′bēr), *adj.* (١) تاریكو ناخۆش؛ دڵتەنگکەر: *( a ~ January day)* .
(٢) (ا) ڕووگرژ؛ گرژ؛ بەرچاو تاریك؛ کۆستکەوتوو؛ مۆن؛ دڵتەنگ:
*( a ~ face)*
(ب) خەفەتاوی؛ دڵگیر؛ بە توند گیراو.
(٣) ڕەشو تاریكو دڵتەنگکەر (جلوبەرگ، ڕەنگ).
**sombrero** (som-brâr′ō), *n.* شەپقەیەکی پووش یا قووماشی لبادی مەکسیکیو ئیسپانییە لێوارەکەی زۆر پانو گەورەیە.
**sombrous** (som′brəs), *adj.* [Archaic], = somber.
**some** (sum), *adj.* (١) هێند؛ هەندێك؛ بڕ:
*( ~ people never change their minds.)*
(٢) (ا) چەند؛ هەند؛ ژمارەیەك؛ بڕێك: *( ~ guests are here already.)* .
(ب) نەختێك؛ تۆزێك؛ هەندێك: *( Give me ~ water.)* .
(٣) نزیکەی: *( ~ twenty of them were injured.)* .
(٤) [Colloq.]، شایانی باسە؛ سەیر؛ سەر ناسا (هەندێك جار بە تەوسەوە):
*( That was ~ party, fight, dinner, etc.)*
*pron.* (١) هەندێك کەس؛ چەند کەسێك:
*( ~ will agree, other will not.)*
(٢) ژمارەیەك یا بڕێکی تایبەتی.
*adv.* (١) نزیکەی *( ~ fifty persons)* .
(٢) [Colloq.]، نەختێك؛ تاڕادەیەك:
*( The snow is ~ deeper than yesterday.)*
**-some** (səm), پاشگرێکە بەمانای: مەیلەو؛ - ئاسا:
*( lonesome; tiresome )*
**-some** (səm), پاشگرێکە بەمانای: بە ژمارەیەکی تایبەتی:
*( threesome)*
**-some** (sōm), پاشگرێکە بەمانای: لەش؛ تەن *( chromosome)* .
**somebody** (sum′bud′i, sum′bəd-i), *n.* کەسێکی گەورە یا گرنگ *( He thinks he is ~ .)*
*pron.* کەسێك؛ زەلامێك؛ یەکێك. *( There's ~ at the door.)* .
**someday** (sum′dā′), *adv.* ڕۆژێك لە ڕۆژان (لە دواڕۆژدا)؛ ڕۆژێك دێت کە

**somehow** (sum′hou′), *adv.* هەرچۆنێك بێ؛ بە هەر شێوەیەك بێ؛ بە هەر جۆرێك بێ:
*( ~ they have solved the problem.; ~ we lost our way.)*
somehow or other, = somehow.
**someone** (sum′wun′, sum′wən), *pron.* = somebody.
**some-place** (sum′plās′), *adv.* [Colloq.], = somewhere.
**somersault** (sum′ēr-sôlt′), *n.* سەرمەوقولات؛ تەقلە؛ تەقلەبازی.
*v.i.* سەرمەوقولاتدان؛ تەقلەلێدان؛ تەقلەبازی کردن.
**somerset** (sum′ēr-set′), *n. & v.i.* = somersault.
**something** (sum′thiŋ), *n.* (١) شتێك:
*( There is ~ I want to show you.)*
(٢) کەسێکی گەورە یا گرنگ.
*adv.* نەختێك؛ تاڕادەیەك.
**sometime** (sum′tīm′), *adv.* (١) لە کاتێکی دیاری نەکراودا؛ ڕۆژێك لە ڕۆژان: *( ~ in summer)* .
(٢) ڕۆژێك لە ڕۆژان لە دواڕۆژدا؛ لە کاتێکی دیاری نەکراوی دواڕۆژدا:
*( I'll visit you ~ .)*
(٣) [Rare]، sometimes .
(٤) [Archaic]، پێشوو؛ هی پێشوو یا جاران.
*adj.* پێشوو؛ هی پێشوو یا جاران:
*( Mr. X, the ~ professor of English)*
**sometimes** (sum′tīmz′), *adv.* (١) جار جار؛ هەندێك جار؛ جار نەجار؛ ناوبەناو: *( We go there ~ .)* .
(٢) [Obs.]، جاران؛ هی پێشوو یا جاران.
**some-way** (sum′wā′), *adv. Also* some way, = somehow.
**someways** (sum′wāz′), *adv.* [Colloq.], = someway.
**some-what** (sum′hwät′, sum′wət), *n.* (١) نەختێك؛ تاڕادەیەك: *( He is ~ of a fool.)* .
(٢) کەسێکی گەورە یا گرنگ؛ شتێکی گرنگ.
*adv.* نەختێك؛ تاڕادەیەك؛ تۆزێك:
*( It's ~ difficult.)*
**somewhere** (sum′hwâr′), *adv.* (١) شوێنێك؛ لە شوێنێکی دیاری نەکراودا. (٢) ( ~ about; ~ in )، لە نزیك (کات، ڕادە، هەند):
*( ~ about seven o'clock)*
*n.* شوێنێکی دیاری نەکراو.
**somewheres** (sum′hwârz′), *adv.* ئەم ووشەیە زمانەوانان بە هەڵەی دادەنێن، بەڵام هەندێك کەس هەر بەکاری دەهێنن لەباتی ووشەی " somewhere ".
**somewhither** (sum′hwith′ēr), *adv.* [Archaic], بەرەو شوێنێك؛ بۆ لایەکی دیاری نەکراو.
**somite** (sō′mīt), *n.* (١) پەلك؛ بەشێکی لەشی گیانەوەرە لە باری درێژی.
(٢) بەشێك یا پەلکێکی وەهای ناولەمەیە.
**somnambulant** (som-nam′byoo-lənt), *adj.* خەوگەڕ؛ خەوڕۆ.
**somnambular** (som-nam′byoo-lar), *adj.* هی خەوگەڕی؛ تایبەتی بە خەوڕۆیی یا خەوگەڕان.
**somnambulate** (som-nam′byoo-lāt′), *v.i.* بەدەم خەوەوە گەڕان؛ لە کاتی نوستندا گەڕان یا ڕۆیشتن؛ خەوگەڕان.
-somnambulation *(n.).*
**somnambulator** (som-nam′byoo-lāt′ēr), *n.* = somnambulist.
**somnambulism** (som-nam′byoo-liz′m), *n.* خەوگەڕی؛ خەوڕۆیی؛ بەدەم خەوەوە گەڕان یا ڕۆیشتن.
**somnambulist** (som-nam′byoo-list), *n.* خەوگەڕ؛ خەوڕۆ؛ کەسێکە کە بەدەم خەوەوە دەگەڕێ یا دەڕوا.

-somnambulistic *(adj.)*.

**somni-** (som-ni), *Also* somn-, پێشگرێکە بە مانای: نوستن؛ خەوتن *( somniferous)* .

**somniferous** (som-nif′ĕr-əs), *adj.* نوێنەر؛ خەولێخەر

**somnific** (som-nif′ik), *adj.* = somniferous.

**somniloquist** (som-nil′ə-kwist), *n.* وڕێنەکەر.

**somniloquy** (som-nil′ə-kwi), *n.* وڕێنە؛ وڕێنەکردن.

**somnolence** (som′nə-ləns), *n.* خەوالوێتی؛ خەوبردنەوە؛ وەنەوزەکوتی؛ خەوهاتن.

**somnolency** (som′nə-lən-si), *n.* = somnolency.

**somnolent** (som′nə-lənt), *adj.* (١) خەوالوو (٢) خەولێخەر؛ نوێنەر.

**son** (sun), *n.* (١) کوڕ؛ منداڵی نێرینە. (٢) (ا) son-in-law . (ب) زڕکوڕ. (٣) ڕۆڵە. (٤) کوڕم!؛ ڕۆڵە!.

**the Son,** عیسا

**sonance** (sō′nəns), *n.* (١) دەنگداری؛ دەنگدارێتی؛ دەنگ هاتن. (٢) [Obs.] (ا) دەنگ. (ب) ئاواز.

**sonant** (sō′nənt), *adj.* (١) دەنگی؛ تایبەتی بە دەنگ. (٢) دەنگدار. (٣) دەنگدار (دەنگزانی).

***n.*** تیپی دەنگدار (دەنگزانی).

**sonar** (sō′när), *n.* کورتەی سێ وشەیە: **[ sound navigation ranging ]** ئامێری دۆزینەوەو دیاریکردنی شوێنی شتی ژێرئاو (وەک ژێردەریایی و پۆلە ماسی؛ بەهۆی شەپۆلی دەنگەوە لە شتەکەوە بۆ ئامێرەکە.

**sonata** (sə-nä′tə), *n.* سۆناتە ئاوازێکی مۆسیقی یەک ئامێرییە (پیانۆ) یا دوو ئامێری (پیانۆو کەمان).

**sonatina** (son′ə-tē′nə, sō′nə-tē′nə), *n.* سۆناتەیەکی کورت (وشەی پێشوو ببینە)

**sonde** (sond), *n.* ئامێرێکە دەنێررێتە ئاسمان بۆ لێکۆڵینەوەی بارو جموجوڵی هەوا.

**sone** (sōn′), *n.* پێوانەی دەنگ.

**song** (sôŋ), *n.* (١) گۆرانی؛ هونەری گۆرانی ووتن: *( He broke into ~.)* (٢) گۆرانی؛ گۆرانییەک؛ بەستە. (٣) (ا) هۆنراوە؛ شیعر (ب) هۆنراوەی بۆ گۆرانی شیاو. (٤) خوێندنی مەل؛ دەنگی خۆشی مەل: *( the ~ of the lark)* .

**for a song,** زۆر بە هەرزان؛ زۆر بە کەم: *( sold for a song)* .

**nothing to make a song about,** ئەوە ناهێنێ؛ هیچوپووچ.

**song and dance,** (١) گۆرانی و سەمای سەر شانۆ. (٢) [Colloq.] قسەی دووروودرێژە بۆ خۆپەراندنەوە یا بیانووهێنانەوە. (٣) [Colloq.] قسەی هیچوپووچ؛ قسەی قۆڕ.

**song-bird** (sôŋ′bûrd′), *n.* (١) مەلی دەنگخۆش. (٢) ئافرەتی گۆرانی بێژ.

**songful** (sôŋ′fool), *adj.* خۆش ئاواز؛ خۆش؛ ساز (دەنگ).

**songless** (sôŋ′lis), *adj.* (١) بێ گۆرانی (٢) گۆرانی نەبێژ.

**song sparrow,** چۆلەکەیەکی دەنگخۆشی ئەمەریکییە

**songster** (sôŋ′stēr), *n.* (١) گۆرانی بێژ (٢) song-writer . (٣) مەلی دەنگخۆش.

**song thrush,** مەلێکی دەنگخۆشە لە تورخمی ڕیشۆڵە.

**song-writer** (sôŋ′rīt′ēr), *n.* گۆرانی نووس؛ گۆرانی دانەر؛ ئاوازی گۆرانی دانەر.

**sonic** (son′ik), *adj.* (١) دەنگی؛ دەنگ: *( a ~ wave)* . (٢) خێراییەکەی ئەوەندەی هی دەنگە.

**sonic barrier,** بەربەستی دەنگ: زیادبوونی بەرهەڵستی هەوا بەرامبەر بە فڕۆکەیەک کە خێراییەکەی نزیک بووبێتەوە لە خێرایی دەنگ. (پێشی دەووترێ: " sound barrier " ).

**sonic boom,** تەقینەوەی دەنگ: تەقینەوەیەکی دەنگی زلە دەبیسترێ کاتێک کە شەپۆلی پاڵەپەستۆیی لە فڕۆکەیەکەوە کە خێراییەکەی لە هی دەنگ زیاتر بێت دەگاتە نزیک زەوی.

**son-in-law** (sun′′n-lô′), *n.* زاوا؛ مێردی کچ.

**sonnet** (son′it), *n.* هەڵبەستێکی چواردە دێرییە دوو جۆری هەیە: " Shakespearean sonnet " و " Petrarchan sonnet " (هەردوو ووشەکە ببینە)

***v.t. & v.i.*** ئەم جۆرە هەڵبەستە پیاهەڵدان؛ ئەم جۆرە هەڵبەستە لەسەر نووسین.

**sonneteer** (sən′ə-tēr′), *n.* (١) هۆنەری هەڵبەستی چواردە دێری (ووشەی پێشوو) (٢) هۆنەری گەند یا هیچوپووچ.

***v.t. & v.i.*** هەڵبەستی چواردە دێری هۆنینەوە.

**sonny** (sun′i), *n.* کوڕم؛ ڕۆڵە!؛ کوڕی خۆم!.

**son of a bitch, (S.O.B.),** [Vulgar Slang], دایک حیز؛ حیزباب؛ ناکەس بەچە؛ زۆڵ؛ کوڕی قەحبە؛ نامەرد.

**son of a gun,** [Slang], (١) هەی زۆڵی قوماربازا؛ ئەی ساختەچی!؛ بێژوو!؛ کەڵەکچی!؛ ئەی سەگە! (ئەم ووتەیە جوێن نییە بەڵام بۆنی جوێنی لێ دێت). (٢) ووتەیەکە لەبەرخۆوە دەووترێ بە شتێک کە دیقی پیاو دەرکات لەبەرئەوەی کە ئیش ناکات یا شکاوە یا ناکەوێتەکار.

**Son of God,** عیسا.

**sonometer** (sō-nom′ə-tēr), *n.* (١) ئامێری پێوانی لەرەو بەرزو نزمی دەنگ. (٢) audiometer .

**sonorant** (sō-nôr′ənt, sō-nō′rənt), *n.* تیپی دەنگدار (دەنگزانی) (وەک دوا دەنگی ووشەی " sudden " ).

**sonority** (sə-nôr′ə-ti, sə-nor′ə-ti), *n.* دەنگدانەوە.

**sonorous** (sə-nôr′əs), *adj.* (١) دەنگدەرەوە؛ دەنگدار. (٢) بڵند (دەنگ)؛ گەورە؛ زل: *( a ~ voice)* . (٣) دەنگەکەی خۆشە بۆ گوێ؛ دەنگەکەی کاردەکاتە سەر مرۆڤ: *( a ~ style of writing, prose, etc.)*

-sonorously *(adv.)*; sonorousness *(n.)*.

**sonship** (sun′ship), *n.* کوڕی؛ فرزەندی (کوڕ)؛ پەیوەندی نێوان کوڕو دایک و باوک.

**soon** (sōōn), *adv.* (١) بەم زووانە؛ پاش ماوەیەکی کەم؛ لەم نزیکانەدا: *( Do come to see us ~.)* (٢) بە زووترین کات؛ بە بێ دواکەوتن: *( I'll come as ~ as possible.)* (٣) زوو؛ پێش کاتی خۆی: *( You come so ~.)* . (٤) بەدڵ؛ بە خۆشی خۆ: *( I would just as ~ stay home as go.)* . (٥) [Obs.] یەکسەر؛ دەستبەجێ.

**as soon as,** هەر کە؛ کوتوپڕ کە؛ یەکسەر کە.

**had sooner,** بە لایەوە باشترە.

**sooner or later,** ئێستە بێ یا لە دواڕۆژدا؛ زوو بێ یا درەنگ؛ شتەکە هەر دەبێ ببێ یا هەر ڕوودەدات تەنها درەنگ و زوویی کەوتووە.

**sooner** (sōōn′ēr), *n.* [Slang], (١) کەسێکە کە لە پێش خەڵکی تردا گەیشتە ناوچە ڕۆژئاواییەکانی ئەمەریکا بۆ ئاوەدانکردنەوەی وە بەم شێوەیە باشترین زەوی بۆ خۆی هەڵبژارد. (٢) کەسێکە کە شتێکی دەست دەکەوێ بە ناڕەوایانە چونکە لە پێش کاتی خۆیدا خۆی بۆ دەکوتێ و دەستی بەسەردا دەکێشێ. (٣) [S-] نیشتەجێیەکی ووڵاتی " ئۆکلاهۆما " ی ئەمەریکی.

**soot** (soot, sōōt), *n.* هێس؛ خڵتە یا سووتووی دووکەڵی ناو لوولە زۆپا؛ خڵتە یا پاشەڕۆکی خەڵووز

***v.t.*** پیس کردن یا ڕەش کردن بەم خڵتەیە.

**sooth** (sōōth), *adj.* [Archaic], (١) ڕاست؛ ڕاستەقینە. (٢) نەرم؛ خۆش؛ شیرین.

***n.*** ڕاستی.

in sooth, [Archaic], = truly.

**soothe** (sōōth), *v.t.* (١) دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنەوایی کردن؛ لاواندنەوە؛

هێمن کردنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ (٢) ئازار کەمکردنەوە؛ ئازار کوشتن یا بڕین؛ ئارام دان: *(to ~ an aching tooth)*.

***v.i.*** ئارام بەخشین؛ هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ.

**soothfast** (sōōth′fast′), ***adj.*** [Archaic], (١) ڕاستگۆ؛ پاك؛ سەرڕاست؛ دڵسۆز. (٢) ڕاست؛ ڕاستەقینە.

**soothing** (sōōth′iŋ), ***adj.*** ئازارکوژ (دەرمان، قسەی خۆش)؛ ئارام بەخش؛ دڵخۆشکەر؛ خۆش؛ هێمنکەرەوە؛ ئارام گیر:

***(a ~ medicine; ~ words)***

**soothly** (sōōth′li), ***adv.*** [Archaic]. = **truly.**

**soothsay** (sōōth′sā′), ***v.i.*** پێشبینین؛ پێشبینی کردن؛ فاڵ گرتنەوە؛ نوقلانەلێدان؛ قراندن

***n.*** نوقلانە؛ پێشبینی؛ فاڵ.

**soothsayer** (sōōth′sā′ẽr), ***n.*** پێشبین؛ فاڵچی؛ فەتاح فاڵ؛ فاڵگر (هەروەها ووشەی " **fortuneteller** ").

**soothsaying** (sōōth′sā′iŋ), ***n.*** (١) پێشبینی؛ فاڵ گرتنەوە؛ نوقلانەلێدان؛ قراندن (٢) نوقلانە؛ فاڵ؛ پێشبینییەك.

**sooty** (soot′i, sōōt′i), ***adj.*** (١) لە خلتە یا سووتوی دووکەڵی ناو لوولە ڕۆیا دەچێ؛ هێسی. (٢) ڕەش و پیس بووە بەم خلتەیە یا بە خلتەی خەڵووز (٣) ڕەش؛ ڕەشباو

**sop** (sop), ***n.*** (١) نانی خووساوی ناو گۆشتاو؛ نانی گوشراوە ناو شیرو گۆشتاوەوە (٢) (ا) شتێکە دەدرێ بە کەسێك بۆ دەمکوت کردنی یا بۆ دڵ ڕاکێشانی... هتد. (ب) بەرتیل. (٣) **milksop**.

***v.t.*** (١) خووساندن؛ لە ئاودا نوقم کردن؛ تەڕکردن؛ گوشینە ناو ئاو یا شلەوە. (٢) ( **~ up** )، هەڵمژین (ئاو، شلە):

***(She ~ped up the water with a towel.)***

***v.i.*** (١) دەڵاندن؛ ئاوتێزان؛ تێزان. (٢) خووسان؛ زۆر تەڕبوون.

**sophism** (sof′iz′m), ***n.*** دەوەن بە ئاشی؛ بیروڕاو گفتوگۆی بە ڕووالەت باش و جوانی لە ڕاستیدا لەنگ و بە هەڵەدابەر؛ بەهەڵەدابردن (بە گفتوگۆی بەسەرزاری جوان و چاك)؛ سۆفستی.

**sophist** (sof′ist), ***n.*** (١) یەکێك لە مامۆستا زیرەکە زمانبازەکانی کۆنی یۆنان کە لە گفتوگۆی بە سەرزاری جوان و ڕاستدا کەس دەرەقەتی نەدەدان. (٢) کەسێکی زانا یا تێگەیشتوو؛ زانا. (٣) زمانبازێکە کە بە گفتوگۆی بە سەرزاری جوان و ڕاست خەڵك بە هەڵەدا دەبات

**sophister** (sof′is-tẽr), ***n.*** قوتابی پۆلی دووەم یا سێیەمی هەندێ زانکۆی ئینگلیزی.

**sophistic** (sə-fis′tik), ***adj. Also*** **sophistical,** (١) سۆفستی (ووشەی " **sophism** " ببینە)؛ دەوەن بە ئاشی. (٢) زیرەکانە و بە سەرزاری درووست و بەجێ بەڵام لە ڕاستیدا بەهەڵەبەر:

***(~ reasoning; a ~ argument)***

**-sophistically** ***(adv.).***

**sophisticate** (sə-fis′tə-kāt′), ***v.t.*** (١) گۆڕین لە بارێکی سرووشتی و سادەوە بۆ بارێکی ناسرووشتی و دەستکردانە؛ چاوکردنەوە؛ کردن بە دنیادیدە. (٢) بەهەڵەدابردن؛ پیس کردن. (٣) ڕوونکردنەوە؛ شل کردنەوە؛ فێڵ تێداکردن؛ ناپوختەکردن. (٤) گۆڕینی دەقی نووسراوێك بەبێ پرسی خاوەنەکەی؛ تێکدان یا شێواندنی دەقی نووسراوێك

***v.i.*** دەوەن بە ئاشی کردن.

***n.*** کەسێکی دنیادیدە؛ کەسێکی لە دنیا شارەزاو تێگەیشتوو.

**sophisticated** (sə-fis′tə-kāt′id), ***adj.*** (١) دنیادیدە؛ لە دنیا شارەزا؛ تێگەیشتوو؛ بزان؛ پێشکەوتوو: ***(a ~ person)***. (٢) شارەزایانە کراوە؛ بەرز؛ مێشك ڕادەکێشێ: ***(a ~ novel)***. (٣) پێشکەوتوو (کەرەسە، ئامێر)؛ ناسادە؛ ئاڵۆز:

***(a ~ equipment, electronic devices, etc.)***

(٤) ڕوونکراوەتەوە؛ ناپوخت؛ فێڵی تێداکراوە ***(a ~ oil)***

**sophistication** (sə-fis′tə-kā′shən), ***n.*** (١) ڕوونکردنەوە؛ فێڵ تێداکردن؛ ناپوختەکردن. (٢) دنیادیدەیی؛ شارەزایی دنیا و ژیان؛ تێگەیشتن؛ سەردەرچوون لە کاروباری ژیان: ***(He has no ~.)***. (٣) پێشکەوتن (ئامێر، پیشەسازی)؛ ئاڵۆزی؛ ناسانی.

**sophistry** (sof′is-tri), ***n.*** = **sophism.**

**sophomore** (sof′ə-môr′, sof′ə-mōr′), ***n.*** (١) قوتابی پۆلی دووەمی زانکۆو قوتابخانەی ناوەندی. (٢) کەسێکە کە زۆر بە زانایی و زیرەکی و شارەزایی خۆیەوە دەنازێ بە شێوەیەکی منداڵانە بەڵام لە ڕاستیدا نە زانایە و نە زیرەك و نە شارەزا.

***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە کەسانە.

**sophomoric** (sof′ə-môr′ik), ***adj. Also*** **sophomorical,** تایبەتی بە کەسێك کە زۆر بە زانایی و زیرەکی و شارەزایی خۆیەوە دەنازێ بە شێوەیەکی منداڵانە بەڵام لە ڕاستیدا نە زانایە و نە زیرەك و نە شارەزا؛

**-sophomorically** ***(adv.).***

**-sophy** (sə-fi), پاشگرێکە بەمانای: ژیری؛ زانین؛ بیری قووڵ:

***(philosophy)***

**sopor** (sō′pẽr), ***n.*** خەوی لە ئەندازە بەدەر قووڵ؛ خەوی زۆر قورس؛ ووڕی؛ کاسی.

**soporiferous** (sop′ə-rif′ẽr-əs), ***adj.*** = **soporific.**

**soporific** (sop′ə-rif′ik, sō′pə-rif′ik), ***adj.*** (١) خەولێخەر (دەرمان)؛ نوێنەر. (٢) هی خەو؛ خەواڵوێتی.

***n.*** دەرمانی خەو؛ دەرمانی نوستن.

**sopping** (sop′iŋ), ***adj.*** خووساو؛ زۆر تەڕ؛ تێراو؛ ئاوی لێ دەتکێ.

**soppy** (sop′i), ***adj.*** (١) **sopping** . (٢) باراناوی. (٣) [British]، بەسۆز

**soprano** (sə-pran′ō, sə-prä′nō), ***n.*** (١) بەرزترین دەنگی گۆرانی ئافرەت و کوڕ. (٢) سۆپرانۆ: گۆرانی بێژێکی ئافرەت یا کوڕی دەنگ بەرز (ئۆپەرا). (٣) دەوری گۆرانی بێژێکی وەها.

**sora** (sō′rə), ***n.*** باڵندەیەکی بچووکی دەنووك کورتی زەلکاوەکانە.

**sorb** (sôrb), ***n.*** (١) درەختێکە لە توخمی سێو. (٢) بەری ئەم درەختە.

**sorb** (sôrb), ***v.t.*** هەڵمژین.

**sorcerer** (sôr′sẽr-ẽr), ***n.*** جادوگەر؛ جادوباز؛ ئەفسونکار؛ ئەفسونباز؛ ئەفسونگەر.

**sorceress** (sôr′sẽr-is), ***n.*** جادوگەری ئافرەت؛ ئەفسونبازی ئافرەت.

**sorcerous** (sôr′sẽr-əs), ***adj.*** هی جادوگەری؛ هی ئەفسونباز یا ئەفسونگەر.

**sorcery** (sôr′sẽr-i), ***n.*** جادوو؛ جادوگەری؛ جادوبازی؛ ئەفسونبازی.

**sordid** (sôr′did), ***adj.*** (١) پیس وپۆخڵ؛ پیس. (٢) پەڕپووت؛ پیس و ناخۆش؛ کوڵۆڵ: ***(~ neighborhoods)*** (٣) نزم؛ پیس و بۆگەن؛ بەد (ڕەفتار): ***(a ~ life)***. (٤) زۆر چاوبرسی؛ پارەپیس؛ بە هیچ تێرنەخۆر؛ بەهەڵپە (بۆ پارە).

**-sordidly** ***(adv.)***; **sordidness** ***(n.).***

**sordino** (sôr-dē′nō), ***n.*** شتێکە بۆ کزکردنی دەنگی ئامێرێکی مۆسیقی.

**sore** (sôr, sōr), ***adj.*** (١) (ا) بە ئێش؛ دەیەشێت؛ ئازاراوی؛ ئاسۆر:

***(a ~ tooth, muscle, etc.)***

(ب) لە ئێش و ئازاردایە. (٢) هەست ناسك؛ دڵ ناسك؛ زوو تووڕە دەبێ. (٣) خەفەتبار؛ خەمبار؛ پەست؛ دڵگیر: ***(Our hearts are ~ for them.)***. (٤) ئێجگار زۆر؛ زۆر پەرێشان: ***(to be in ~ need for help)***. (٥) ناخۆش (باس)؛ برین کولێنەوە: ***(a ~ subject)***. (٦) [Colloq.]، زیر؛ زویر؛ تووڕە: ***(to feel ~ about something)***.

***n.*** (١) برین؛ ئاسۆر. (٢) هۆی ئازارو ناخۆشی و پەستی و زویری.

***adv.*** [Archaic], = **sorely.**

**-soreness** ***(n.).***
**sorehead** (sôr′hed´, sōr′hed´), ***n.*** [Slang], کەسێکی تووڕەو تڕۆو کینە هەڵگرو بۆڵەبۆڵکەر.
**sorely** (sôr′li, sōr′li), ***adv.*** (١) بە جۆرێك کە بگاتە تینی ئەو کەسە؛ تاڕادەیەك کە ببێتەهۆی ئێش و ئازار: ***( His patience was ~ tried.)*** .
(٢) ئێجگار زۆر: زۆر؛ بە پەرێشانانە: ***( Help is ~ needed.)*** .
**sore throat,** قورگ ئێشە؛ گەروو چووزانەوە؛ قورگ هاتنەوەیەك.
**sorghum** (sôr′gəm), ***n.*** (١) گەنمەشامی شیرین (دۆشاوی لێ دەردەهێنرێ و دەیشدرێ بە ئاژەڵ وەك ئالف). (٢) دۆشاوی ئەم گەنمەشامی‌یە شیرینە. (٣) شتێکی زۆر بەسۆز.
**sorgo** (sôr′gō), ***n.*** جۆرێکە لە گەنمەشامی شیرین (بەزۆری بۆ دۆشاوو شەکر پەروەردە دەکرێ).
**soricine** (sôr′i-sīn´, sor′i-sīn´), ***adj.*** لە گیاندارێك دەچێ وەك مشك وایە
**sorites** (sō-rī′tēz), ***n.*** زنجیرە بیروباوەڕو ئەنجامی ڕێك‌وپێك و بەجێ (ژیربێژی).
**sororal** (sə-rôr′əl), ***adj.*** خوشکانە؛ وەك خوشك.
**sororate** (sə-rô´rā′t), ***n.*** ژن خوشکی خۆ هێنان (پاش مردنی ژنەکە یا ئەگەر ژنەکە منداڵی نەبێت).
**sororicide** (sə-rôr′ə-sīd´, sə-ror′ə-sīd´), ***n.*** (١) خوشکی خۆ کوشتن. (٢) خوشکی خۆ کوژ.
**sorority** (sə-rôr′ə-ti, sə-ror′ə-ti), ***n.*** ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی کچانی زانکۆیە ئەندامەکانی پێکەوە دەژین لە خانوویەکی گەورەدا.
**sorosis** (sə-rō′sis), ***n.*** یانە یا ڕێکخراوی ئافرەتان.
**sorrel** (sôr′əl, sor′əl), ***n.*** ترشۆکە گیایەکی ترشە گەڵاکەی لە سلق دەچێ دەکرێتە زەڵاتەوە.
**sorrel** (sôr′əl, sor′əl), ***n.*** (١) قاوەیی سوورباو.
(٢) ئەسپی سووربۆر؛ سووربۆر.
**sorrel tree,** درەختێکی ئەمەریکی هەمیشە سەوزی تۆنکڵ ئەستووری گوڵ سپی بەر بۆری گەڵا تاڵە.
**sorrow** (sor′ō, sôr′ō), ***n.*** (١) خەم‌وخەفەت: دەردی دڵ؛ سوێ؛ داخ؛ پەژارە (٢) هۆی داخ‌وخەفەت؛ لێقەومان؛ ئەهات؛ نەگبەتی.

(٣) خەمباری؛ دڵگیری؛ خەفەتباری؛ دڵتەنگی.
***v.i.*** خەم خواردن؛ خەفەت خواردن؛ سوێ چوون بە دڵەوە.
**sorrowful** (sor′ō-fəl, sôr′ō-fəl), ***adj.*** (١) خەفەتبار؛ خەمبار؛ دڵگیر؛ دڵتەنگ: غەمگین. (٢) خەفەت پێدەر؛ مایەی خەم؛ ناخۆش؛ دڵگیر.
**-sorrowfully** ***(adv.)***; **sorrowfulness** ***(n.).***
**sorry** (sôr′i, sor′i), ***adj.*** (١) خەمبار؛ بە داخەوە؛ پێی ناخۆشە:
***( I am ~ to hear that your mother is dead.)***
(٢) پەشیمان؛ داوای لێبووردن کردن:
***( If you say that you're ~ , we'll forgive you.)***
(٣) ببورە؛ داخەکەم: ***( I am ~ to be late.)*** .
(٤) گەند: هیچ‌وپووچ؛ خراپ:
***( a ~ excuse; a ~ exhibition of acting)***
(٥) ناخۆش؛ خراپ؛ دڵپەستکەر:
***( ~ news; a ~ state of affairs; a slum is a ~ place)***
**-sorrily** ***(adv.)***; **sorriness** ***(n.).***
**sort** (sôrt), ***n.*** (١) بابەت؛ توخم؛ چەشن.
(٢) جۆر: چەشن: ***( Remarks of the ~ will get you trouble.)*** .
(٣) شێوە (ڕەفتار نواندن)؛ شێواز؛ ڕێ؛ چۆنێتی:
***( He spoke in a queer ~ .)***
(٤) (*pl.*) ، تیپ (چاپکاری).
***v.t.* ( ~ out ),** هاوپۆل کردن؛ پاك‌وپیس کردن؛ جیاکردنەوە؛ بابەت بابەت کردن.
***v.i.*** [Archaic], (١) هاودەمی کردن؛ لەگەڵدابوون. (٢) لەگەڵدا گونجان.
**-sorter** ***(n.).***
**of sorts,** (١) جۆراوجۆر؛ هەمەچەشن. (٢) گەند؛ خراپ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ فەڕ؛ قەڵب؛ هەر بەناو؛ هیچ. (هەروەها **" of a sort "**):
**[ we had a vacation (dinner, party, celebration, reunion) of sorts.]**
**out of sorts,** (١) زیز؛ زویر: تووڕە؛ پەست.
(٢) [Colloq.]، نەختێك نەخۆش؛ ناساغ.
**sort of,** [Colloq.], تاڕادەیەك؛ نەختێك:
***( I sort of thought this would happen.; He is sort of mad, crazy, happy, tired, etc.)***
**sort out,** جیاکردنەوە؛ پۆل پۆل کردن؛ پاك‌وپیس کردن.
**sortie** (sôr′ti), ***n.*** (١) هێرشی لەشکری گەمارۆدراو بۆ سەر لەشکری گەمارۆدەر. (٢) ئەو هێزەی ئەم هێرشە دەکات.
(٣) هێرشێکی فڕۆکەی جەنگ:
***( Their bombers flew fifty ~s a day.)***
**sortilege** (sôr′ti-lij), ***n.*** (١) بەخت لێکدانەوە بە پیانقۆ.
(٢) جادوگەری؛ جادوبازی؛ جادوو؛ ئەفسونبازی.
**S O S** (es′ō′es′), **( Save Our Souls!),** (١) ڕزگارمان کەن!؛ فریامان کەون!: شفرەی جیهانی‌یە بۆ داوای فریاکەوتن لەلایەن کەشتی و فڕۆکەوە لەکاتی تەنگانەدا. (٢) بانگەوازی فریاکەوتن.
**so-so** (sō′sō´), ***adj. & adv.*** نە باشەو نە خراپ؛ خراپ نی‌یە؛ مام ناوەندی.
**sot** (sot), ***n.*** کەسێکی هەمیشە سەرخۆش.
**soteriology,** بیروباوەڕی ئاینی ڕزگاری لە ڕێی عیساوە.
**sotol** (sō′tōl, sō-tōl′), ***n.*** درەختێکی بیابانی ئەمەریکی‌یە.
**sottish** (sot′ish), ***adj.*** (١) وڕ لە مەستیدا؛ حۆل؛ گەلحۆ.
(٢) مەست؛ سەرخۆش.
**sotto voce,** بە چرپە؛ لە ژێر لێوەوە؛ بە دەنگێکی زۆر نزم.
**sou** (sōō), ***n.*** پارەیەکی کۆنی فەرەنسی کەم نرخە.
**soubrette** (sōō-bret′), ***n.*** (١) (ا) کارەکەرێکی بەنازو تەڵەکەبازو بێ حەیای شانۆنامەی پێکەنیناوی و ئۆپەرایە. (ب) ئافرەتێك کە ئەم دەورە دەبینێ. (٢) کچێکی چاوباشقاڵی هیچ‌وپووچ.
**soubriquet** (sōō′bri-kā´), ***n.*** = **sobriquet.**
**souchong** (sōō′shôŋ´), ***n.*** جۆرە چایەکی ڕەشی چینە.
**souffle** (sōō′f'l), ***n.*** دەنگێکی نەرمە وەك بە بیستۆکی پزیشك دەبیسترێ.
**soufflé** (sōō´flā′, sōō′flā), ***adj.*** سووك و پفەڵ (چێشت لێنان)؛ فشەڵ: ***( cheese ~ )*** .
***n.*** چەند جۆرە خواردەمەنی‌یەکن سپێنەی هێلکەی شڵەقاویان تێ دەکرێ پێش لێنان تاکو پفەڵ یا فشەڵ و سووك دەرچن.
**sough** (suf, sou), ***n.*** وڕژەووڕژی با بەناو درەختدا (کە لە ناڵە یا هەناسە هەڵکێشان دەچێ بەتایبەتی کاج یا سنەوبەر)؛ ئەم لوورە لوورە یا شنەیە.
***v.i.*** وڕژەووڕژ هاتنی با بەناو درەختدا؛ لوورەلوورکردن؛ شنە هاتن.
**sought** (sôt), *past tense and past participle of* **seek.**
**soul** (sōl), ***n.*** (١) گیان؛ گیانی ئادەمیزاد. (٢) گیانی مردوو.
(٣) دەروون. (٤) نەژاد؛ ناوکرۆك؛ گرنگترین بەش؛ ناوجەرگە:
***( Brevity is the ~ of wit.)***
(٥) سەرۆك؛ گرنگترین کەس؛ گیان و دڵ (مەجاز):
***( He was the ~ of the revolution.)***
(٦) نموونە؛ وێنە: ***( She is the ~ of kindness.)*** .
(٧) کەس؛ مرۆڤ: ***( I didn't see a ~ there.)*** .
**soul brother,** [Slang], برادەری قولەڕەش.
**soul food,** چەند جۆرە خواردنێکی تایبەتی‌یە بە قولەڕەشەکانی ئەمەریکا
**soulful** (sōl′fəl), ***adj.*** هەست قووڵ؛ هەست بەرز؛ بەهەست؛ بەسۆز.

-soulfully *(adv.)*; soulfulness *(n.)*.

**soulless** (sōl′lis), *adj.* بێ هەست؛ هەست مردوو؛ خۆپەرست؛ بێ دڵ و گیان.

**sound** (sound), *n.* (١) دەنگ. (٢) شەپۆلی دەنگ.
(٣) دەنگی تایبەتی: *( the ~ of aircraft overhead)*.
(٤) تەقەورەقە؛ دەنگ؛ تەقە. (٥) دەنگی قسە.
(٦) مەودای دەنگ: *( within ~ of the guns)*.
(٧) شێوەی هاتنەبەر گوێ: *( We liked the ~ of his report.)*.
(٨) دەنگەدەنگ؛ گەرەلاوژە.
(٩) [Archaic]. ووتووات؛ قاو؛ مقۆمقۆ؛ دەنگ.
*v.i.* (١) دەنگ لێوەهاتن؛ دەنگ هاتن.
(٢) وادیاربوون (بە دەنگی شتەکەدا)؛ لەوەچوون:
*( Her voice ~s troubled.; That plan ~s reasonable.)*
*v.t.* (١) دەنگ لێوەهێنان
(٢) لێدان (دەنگ)؛ بانگ کردن؛ بانگ هەڵدان؛ بڵاوکردنەوە:
*( He ~ed the alarm.; The clock ~s the hour.)*
(٣) بێژان؛ ووتن؛ بە دەنگی بەرز ووتن. (٤) ئاهەنگ بۆ گێڕان.
(٥) تاقیکردنەوەی دەنگی سنگ و دڵ بە بیستۆکی پزیشك.
**sound off,** (١) قیژاندن: بە دەنگی بەرز ووتن؛ هاوارکردن.
(٢) [Slang]، رای خۆ بە توندی دەربڕین؛ لاف لێدان بە دەنگی بەرز.

**sound** (sound), *adj.* (١) پتەو؛ نەرزیو؛ باش؛ بێ کەم و کووڕی:
*( a ~ timber)*
(٢) ساغ؛ تەندرووست؛ چاك؛ نەخۆش نییە: *( of ~ mind and body)*.
(٣) مەترسی نابووتی لێ ناکرێ؛ چەسپیو؛ پتەو؛
*( a ~ business, bank, economy, etc.)*
(٤) بەجێ؛ لەسەر بنچینەیەکی راست دانراوە؛ درووست:
*( a ~ method; ~ judgement)*
(٥) پتەو؛ قایم؛ چەسپیو: *( a ~ foundation)*.
(٦) پشت پێ بەستراو.
(٧) قوول (خەو)؛ خۆش (خەو): *( a ~ sleep)*.
(٨) پاك (رەووشت، مرۆڤ)؛ راست؛ درووست؛ جوان (رەفتار).
(٩) تەواو؛ چاك: *( a ~ flogging, beating, etc.)*.
(١٠) لەسەر نەریتی کۆن ڕۆیشتوو؛ کۆنەپەرست.
(١١) یاسایی؛ درووست (لە ڕووی یاساوە).
-soundly *(adv.)*; soundness *(n.)*.

**sound** (sound), *n.* (١) کەنداوی پان؛ گەروئاوی پان.
(٢) کەنداو یا پەلی دەریایی درێژبووەوە بۆ ناو ووشکانی.
(٣) هەوادانی ماسی؛ کیسەی هەوای ماسی.
(پێشی دەووترێ: " air bladder ").

**sound** (sound), *v.t.* (١) پێوانی قووڵی ئاو.
(٢) لێکۆڵینەوە و پشکنینی بنی دەریا.
(٣) ( ~ out ) ، بۆ دەرکەوتن یا لێ دەرهێنانی بیروڕای کەسێك بە پرسیاری لابەلایی *( to ~ somebody out about a subject)*.
(٤) پشکنینی برین و بۆشایی لەش بە ئامێرێکی باریك و کول (پزیشکەوانی).
*v.i.* (١) قووڵی ئاو پێوان. (٢) چوونە ژێر ئاوەوە.
(٣) دۆزینەوەی شتێك بە پرسیاری لابەلایی؛ قسە لێ دەرهێنان.
*n.* (١) پێوان (قووڵی ئاو).
(٢) ئامێرێکی باریك و کوڵە بۆ پشکنینی برین و بۆشایی لەش (پزیشکەوانی).

**sound barrier,** = sonic barrier.

**sound board,** = sounding board.

**sound camera,** کامێرای دەنگی کامێرایەکە کە دەنگیش تۆمار دەکات لە هەمان کاتدا کە وێنە دەگرێ.

**sound effects,** دەنگی لاسایی دەستکردی بەرنامەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و شانۆنامە و فیلم (وەك دەنگی هەورەتریشقە و گیانەوەر و لێدان و ئۆتۆمبیل... هتد).

**sounder** (soun′dēr), *n.* پێوەری قووڵی ئاوی دەریا (ئامێر، مرۆڤ).

**sounder** (soun′dēr), *n.* ڕەوە بەرازی کێوی.

**sounding** (soun′diŋ), *adj.* (١) دەنگدار؛ دەنگی لێوەدێت.
(٢) دەنگ دەداتەوە. (٣) فشەچی؛ زل (قسە).

**sounding** (soun′diŋ), *n.* (١) پێوانی قووڵایی ئاوی دەریا و دەریاچە بە پەتێك کە شتێکی قورس بە سەرێکیەوە بەستراوە. (٢) قووڵایی بەم شێوەیە پێوراو. (٣) *(pl.)* ، قووڵاییەکی لە ٦٠٠ پێ زیاتر کە دەتوانرێ وەها بپێورێ.

**sounding board,** (١) تەختەی دەنگدەرەوە (لە ئامێری مۆسیقادا بۆ زیادکردن و ڕوونی دەنگەکەی). (٢) قووچکەی دەنگدەرەوە (بۆ گەورەکردن و ئاراستەکردنی دەنگی قسەکەر لە دوانگەوە بۆ گوێگرەکان).
(٣) کەسێك یا تاقمە کەسێکە کە باش و خراپی بیروڕایەکیان پێ تاقی دەکرێتەوە پێش بڵاوکردنەوەی بەسەر هەموو خەڵکدا. (٤) بڵاوکەرەوەی بیروڕا.

**sounding lead,** قورقوشمی بەستراو بە سەرێکی پێوەری قووڵایی ئاوەوە.

**sounding line,** هێڵی پێوەر: پەتێکە سەرێکی قورقوشمی پێوە بەستراوە قووڵایی ئاوی دەریا و دەریاچەی پێ دەپێورێ. (هەروەها " lead line ").

**soundless** (sound′lis), *adj.* بێ دەنگ؛ کپ.

**soundly** (sound′li), *adv.* (١) بە ڕێك و پێکی؛ بە بێ هەڵە:
*( He reasons ~.)*
(٢) بە قورسی (نوستن)؛ بە جۆرێك کە بە ئاسانی خەبەری نەبێتەوە:
*( He sleeps ~.)*
(٣) بە تەواوی: *( The enemy was defeated ~.)*.

**sound-proof** (sound′prōōf′), *adj.* دەنگبڕ؛ دەنگی بۆ نایەت؛ دەنگ بەربەستکەر: *( a ~ room, material, etc.)*.
*v.t.* دەنگبڕکردن؛ بەربەستی دەنگ لێ کردن:
*( to ~ a room, studio, etc.)*

**sound track,** هێڵی دەنگ: ئەو بەشەی قەراغی شریتی سینەمایە کە دەنگەکەی لەسەر تۆمار دەکرێت.

**soup** (sōōp), *n.* (١) شۆربا.
(٢) [Slang]، نیتراتی گلیسرین.
(٣) [Slang] تەمومژی چڕ (هەندێك جار بە بارانەوە).
(٤) [Slang]، تین (مەکینە)؛ ووزە.
**in the soup, [Slang],** پەرێشان؛ لە تەنگوچەڵەمەدایە؛ لە ناخۆشیدایە.
**soup up. [Slang],** تین پێدان (مەکینە)؛ بەهێزترکردن.

**soupcon** (sōōp′sŏn′), *n.* تۆزێك (تام)؛ نەختالێك.

**soup kitchen,** چێشتخانەی هەژاران: شوێنێکە بە خۆڕایی خواردەمەنی تێدا دەدرێ بە هەژارەکان.

**soup-spoon** (sōōp′spōōn′), *n.* کەوچکی شۆربا.

**soupy** (sōōp′i), *adj.* (١) شۆربایی؛ شلە وەك شۆربا؛ لە شۆربا دەچێ.
(٢) تەماوی؛ تەمومژاوی. (٣) [Colloq.]، بەسۆز.

**sour** (sour), *adj.* (١) ترش.
(٢) ترشاو؛ بژکاو؛ بۆگەن: *( ~ milk)*.
(٣) تووڕەوتڕۆ؛ زیز؛ پەست؛ ڕووترش؛ ڕووناخۆش؛ ڕقاوی؛ ڕووگرژ:
*( a ~ temper; Failure made him ~.)*
(٤) خراپ؛ گەند؛ داوێنپیس دواوە: *( His game has gone ~.)*.
(٥) ناخۆش؛ تێکچوو: *( Their relashionship went ~.)*.
(٦) زۆر ترش (خاك).
(٧) کبریتاوی (بەنزین)؛ ناوەڕۆکی گۆگردی تێدایە.
*n.* (١) شتی ترش.
(٢) خواردنەوەیەکی مەستکەری ترش: *( a whisky ~ )*.
*v.t.* ڕوو ترش و تاڵ کردن؛ تووڕەوتڕۆکردن؛ ڕقاوی کردن؛ تێکدان؛ خراپ کردن: *( Continued adversity had ~ed his temper.)*.
*v.i.* (١) ترشان؛ بژکان؛ بۆگەن کردن.
(٢) (ا) ڕوو ترش و تاڵ بوون؛ ڕقاوی بوون.
(ب) تێکچوون (پەیوەندی برادەری)؛ ناخۆش بوون.

*( Their relashionship ~ed after that incident.)*

**source** (sôrs, sōrs), *n.* (١) سەرچاوە (ڕووبار، چەم، ئاو).
*( Books are a ~ of knowledge.;* (٢) سەرچاوە
*The news comes from a reliable ~ .)*
(٣) هۆ. (٤) سەرچاوە (باس).
(٥) بنج و بناوان؛ ڕەگ و ڕیشە؛ ڕیشە؛ سەرەتا.

**sour cherry,** بەلالووك

**sour-crout** (sour′krout), *n.* = **sauerkraut.**

**sourdine** (sōōr-dēn′), *n.* (١) ئامێرێكی مۆسیقای كۆنە.
(٢) شتێكە بۆ كزكردنی دەنگی كەمانچە.

**sour-dough** (sour′dō´), *n.* (١) هەویر ترش.
(٢) كەسێكە كە بە دوای زێڕدا گەڕاوە لە ڕۆژاوای ئەمەریكاو كەنەدا؛ نیشتەنی‌یەكی كۆنی ئەم ناوچانە (بەتایبەتی كە بە تەنیا ژیابێ).

**sour grapes,** شتێكە كە كەسێك لە نرخی كەم دەكاتەوە چونكە دەستی نایگاتێ (ڕێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ دەیووت ترشە).

**sourish** (sour′ish), *adj.* نەختێك ترش

**sour-puss** (sour′poos´), *n.* [Slang], كەسێكی هەمیشە ڕووترش یا ڕووگرژ؛ كەسێكی بەرچاو تاریك و ڕووناخۆش.

**sousaphone** (sōō′zə-fōn´, sōō′sə-fōn´), *n.* سوورەفۆن: ئامێرێكی مۆسیقایە.

**souse** (sous), *n.* (١) سەرو پێی ترشیاتكراوی بەراز.
(٢) سوێراوی ترشیات.
(٣) نوقوم كردن لە سوێراوی ترشیاتدا؛ خستنەناو ئاوی ترشیاتەوە.
(٤) [Slang] كەسێكی مەست یا سەرخۆش.

*v.t.* (١) ترشیات كردن؛ كردن بە ترشیات؛ ترشیات گرتنەوە؛ خستنە ناوی ترشیاتەوە. (٢) نوقوم كردن؛ خستنە ناو شلەوە؛ تەڕكردن.
(٣) سەرخۆش كردن؛ مەستكردن.

*v.i.* زۆر تەڕبوون؛ خووسان.

**souse** (sous), *n.* شالاو (وەك هی هەڵۆ)؛ لە پڕ بەسەردادان.

***v.t. & v.i.*** **( ~ on; ~ upon ),** شالاو بۆ بردن (وەك واشە یا هەڵۆ)؛ لە پڕ بەسەردادان

**soused** (soust), *adj.* [Slang], مەست؛ سەرخۆش.

**soutache** (sōō′tåsh´), *n.* شریتێكی هۆنراوەی ڕازێنەرەوەیە.

**soutane** (sōō-tän′), *n.* چاكەتی قەشەی كاسۆلیكی.

**south** (south), *n.* (١) باشوور؛ خواروو.
(٢) ناوچەیەكی باشووری.
(٣) [S-]، ناوچەی تەوەرەی باشووری؛ هەرێمی خواروی زەمین.

*adj.* (١) باشووری؛ خواروو؛ هی خواروو.
(٢) هی باشوور؛ لە باشوورەوە هەڵكردوو یا هاتوو: *( a ~ wind)* .
(٣) [S-]، خواروو؛ باشوور: *( ~ America)* .

*adv.* بەرەو خوار؛ بەرەو باشوور.

**the South,** (١) هەرێمی باشووری ئەمەریكا.
(٢) كۆنفیدراسیۆنی وولاتە باشوورەكانی ئەمەریكا لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریكادا.

**south-bound** (south′bound´), *adj.* بەرەو خوار؛ بەرەو خوار ڕۆیشتوو: *( a ~ train)* .

**south-east** (south´ēst′), *n.* (١) خوارووی ڕۆژهەڵات.
(٢) هەرێمی خوارووی ڕۆژهەڵات.

*adj.* (١) بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات؛ هی خوارووی ڕۆژهەڵات.
(٢) لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .

*adv.* لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە؛ بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات.

**south-easterly** (south´ēs′tēr-li), *adj. & adv.* (١) هی خوارووی ڕۆژهەڵات؛ بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات: *( a ~ direction)* .
(٢) لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .

**south-eastern** (south´ēs′tērn), *adj.* (١) هی خوارووی ڕۆژهەڵات؛ بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات. (٢) لە خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)*

**south-eastward** (south´ēst′wērd), *adv. & adj.* بەرەو خوارووی ڕۆژهەڵات.

*n.* هەرێم یا شوێنێكی خوارووی ڕۆژهەڵات.

-sout-eastwardly *(adv.).*

**sout-eastwards** (south´ēst′wērdz), *adv.* = **south-eastward.**

**souther** (sou*th*′ēr), *n.* بای باشوور؛ بای وەشت؛ گەرداو یا گەردەلوولی باشووری.

**southerly** (su*th*′ēr-li), *adj.* (١) هی باشوور؛ بەرەو باشوور.
(٢) لە باشوورەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .

*adv.* (١) بەرەو باشوور. (٢) لە باشوورەوە.

**southern** (su*th*′ērn), *adj.* (١) هی باشوور؛ بەرەو باشوور.
(٢) لە باشوورەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .
(٣) [S-]، هی باشووری ئەمەریكا یا هەر شوێنێكی تر.

*n.* نیشتەنی‌یەكی ناوچەكانی باشوور؛ باشووری (مرۆڤ).

**southerner** (su*th*′ēr-nēr), *n.* (١) كەسێكی باشووری؛ نیشتەنی‌یەكی ناوچەی باشوور. (٢) [S-]، نیشتەنی‌یەكی هەرێمە باشوورەكانی ئەمەریكا؛ خەڵكی باشوور؛ كەسێكە كە لە باوو باپیرەوە نیشتەنی ناوچە باشوورەكانی ئەمەریكا بووبێ.

**southern lights,** = **aurora australis.**

**southernly** (su*th*′ērn-li), *adj. & adv.* = **southerly.**

**southernmost** (su*th*′ērn-mōst´), *adj.* ئەوپەڕی باشوور.

**southernwood** (su*th*′ērn-wood´), *n.* درەختە باشووری: درەختێكی گوڵ زەردی گەڵا بۆن خۆشە (هەندێك جار لە بیرە دروستكردندا بەكاردەهێنرێ).

**southing** (sou*th*′iŋ), *n.* (١) بەرەو باشوور چوون.
(٢) جیاوازی هێڵی پانی نێوان دوو خاڵ بەهۆی بەرەو باشوور ڕۆیشتنەوە (كەشتی‌یەوانی).

**southland** (south′lənd, south′land´), *n.* (١) زەمینی باشوور.
(٢) هەرێمی باشووری وولاتێك.

**southmost** (south′mōst), *adj.* = **southernmost.**

**southpaw** (south′pô′), *n.* [Slang], یاریكەری چەپلەر (بەتایبەتی هی بەیسبۆڵ).

*adj.* [Slang], چەپلەر.

**South Pole,** تەوەری باشوور.

**southron** (su*th*′rən), *n.* (١) كەسێكی باشووری (بەتایبەتی ئوسكوتلەندی‌یەك بە ئینگلیزێك وا دەڵێ). (٢) كەسێكی خەڵكی خوارووی ئەمەریكا.

*adj.* باشووری.

**southward** (south′wērd), *adj. & adv.* بەرەو باشوور؛ بەرەو خوار.

*n.* ناوچەیەكی باشووری.

**southwardly** (south′wērd-li), *adj. & adv.* (١) بەرەو باشوور؛ بەرەو خوار. (٢) لە باشوورەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .

**southwards** (south′wērdz), *adv.* = **southward.**

**southwest** (south´west′), *n.* (١) باشووری خۆراوایی.
(٢) ناوچەیەكی باشووری خۆراوایی.

*adj.* (١) هی باشووری خۆراوایی؛ بەرەو باشووری خۆراوایی.
(٢) لە باشووری خۆراوایی‌یەوە هەڵكردوو: *( a ~ wind)* .

*adv.* لە باشووری خۆراوایی‌یەوە؛ بەرەو باشووری خۆراوایی.

**southwester** (south´wes′tēr), *n.* (١) گەردەلوولی باشووری خۆراوایی. (٢) كڵاوی ئاودانەدەری كەشتی‌یەوان.

**southwesterly** (south´wes′tẽr-li), ***adj. & adv.*** (١) هی باشووری خۆراوا؛ بەرەو باشووری خۆراوا: ***(a ~ direction)***. (٢) لە باشووری خۆراواوە هەڵكردوو: ***(a ~ wind)***.

**southwestern** (south´wes′tẽrn), ***adj.*** (١) هی باشووری خۆراوا؛ بەرەو باشووری خۆراوا. (٢) لە باشووری خۆراواوە هەڵكردوو: ***(a ~ wind)***. (٣) [-S]، تایبەتی بە هەرێمی باشووری خۆراوای ئەمەریكا.

**southwestward** (south´west′wẽrd), ***adv. & adj.*** بەرەو باشووری خۆراوایی.

***n.*** ناوچەیەكی باشووری خۆراوایی.

**southwestwardly** (south´west′wẽrd-li), ***adj. & adv.*** - (١) بەرەو باشووری خۆراوایی. (٢) لە باشووری خۆراوایییەوە هەڵكردوو: ***(a ~ wind)***

**southwestwards** (south´west′wẽrdz), ***adv.*** = **southwestward.**

**souvenir** (so͞o´və-nēr′, so͞o′və-nēr´), ***n.*** یادگار.

**sou'wester, souwester** (sou-wes′tẽr), ***n.*** = **southwester.**

**sovereign** (sov′rin, sov′ẽr-in, suv′rən), ***adj.*** (١) بەرزترین؛ بەدەسەڵاترین؛ زاڵترین: ***(~ ruler)***. (٢) سەربەخۆ؛ سەربەست: ***(a ~ state)***. (٣) ناباب؛ بەرز؛ باشترین: ***(~ virtue)***. (٤) زۆرباش؛ زۆر بەكار: ***(a ~ remedy for skin diseases)***. (٥) پاشایانە؛ لە پاشا هاتوو؛ تایبەتی بە پاشا.

***n.*** (١) پادشا؛ پاشا؛ خاوەن شكۆ. (٢) پارەیەكی زێڕی ئینگلیزییە نرخی پاوەندێكە.

**sovereignly** ***(adv.)***.

**sovereignty** (sov′rin-ti, suv′rən-ti), ***n.*** (١) پادشایەتی؛ دەسەڵات و پلەوپایەی پادشا. (٢) بەرزترین دەسەڵات (لە وڵاتدا)؛ دەسەڵاتی بەرز. (٣) سەربەخۆیی؛ سەربەستی؛ سەروەری: ***(state ~)***. (٤) وڵاتێكی سەربەخۆ. (٥) دەسەڵات ***(to have ~ over)***.

**soviet** (sō′vi-it, sō′vi-et´, sō´vi-et′), ***n.*** سۆڤیەت. ئەنجومەنی كرێكارو جوتیاران.

***adj.*** (١) سۆڤیەتی؛ تایبەتی بە ئەنجومەنی كرێكارو جوتیاران. (٢) [-S]، هی یەكێتی سۆڤیەت.

**sovietism** (sō′vi-it-iz′m), ***n.*** سۆڤیەتێتی؛ فەرمانڕەوایی ئەنجومەنی كرێكارو جوتیاران؛ شیوعێتی.

**sovietize** (sō´vi-ə-tīz′), ***v.t.*** گۆڕین بۆ سۆڤیەت؛ شێوەی فەرمانڕەوایی كردن بە هی سۆڤیەتی.

**-sovietization** ***(n.)***.

**sovran** (sov′rən, suv′rən), ***adj. n.*** = **sovereign.**

**sow** (sou), ***n.*** (١) مانۆس؛ بەرازی مێ. (٢) (ا) حۆگەی ئاسنی تواوە بردن لە كوورەوە بۆ قاڵبی دارشتن. (ب) دارێژەی ناو جۆگەیەكی وەها.

**sow** (sō), ***v.t.*** (١) تۆودان؛ چاندن (تۆو)؛ وەشاندن. (٢) ناشتن؛ زەوی چاندن. (٣) بڵاوكردنەوە؛ ناشتن (مەجاز): ***(to ~ the seeds of hatred)***.

**-sower** ***(n.)***.

**sow-belly** (sou′bel´i), ***n.*** [Colloq.], گۆشتی بەرازی سوێركراو.

**sow bug,** = **wood louse.**

**sown** (sōn), *alternative past participle of* **sow.**

**sow thistle,** پووەكێكی گوڵ زەردی گەڵا دركاوییە.

**sox** (soks), *pl of* **sock.**

**soy** (soi), ***n.*** (١) سۆزی خۆشاوی سۆی (كە لە ئینانی ماسی و گۆشت و هەندێ سەوزەدا بەكاردەهێنرێت). (٢) **soybean**.

**soya** (soi′ə, sō′yə), ***n.*** [British], = **soy.**

**soybean** (soi′bēn´), ***n.*** (١) پووەكێكە لە لۆبیا دەچێ و بەرێكی وەك لۆبیا دەگرێ لە كەلوودا. (٢) بەری ئەم پووەكە (ئاردو ڕۆن و خۆشاوی لێ دەردەهێنرێ و بە ساغیش لێ دەنرێ).

**spa** (spä), ***n.*** (١) گەراو؛ كانلو. (٢) گەراوخانە؛ سەیرانگای گەراو.

**space** (spās), ***n.*** (١) بۆشایی؛ جێی بەتاڵ؛ جێی چۆڵ. (٢) ماوە (شوێن)؛ جێ؛ شوێن. (٣) جێ‌وڕێ؛ جێیەك كە بەش بكات؛ جێ: ***(We couldn't find a parking ~.)***

(٤) جێ (فڕۆكە، شەمەندەفەر، كەشتی... هتد)؛ جێی گیراو؛ جێی دانیشتن؛ كورسی. (٥) (ا) ماوە؛ كات: ***(not enough ~ between arrival and departure)***

(ب) ماوەیەكی كەم: ***(for a ~)***.

(٦) بۆشایی ئاسمان؛ ئاسمان؛ بۆشایی ئاسمان.

(پێشی دەووترێ: " **outer space** ").

(٧) بۆشایی نێوان هێڵی مۆسیقا.

(٨) پارچە كانزای نێوان دوو تیپ (چاپكاری).

(٩) [.Obs]، كاتی دانراو بۆ شتێك.

***v.t.*** بۆشایی خستنە بەینەوە؛ جیاكردنەوە لە یەك بە بۆشایی.

**space-craft** (spās′kraft´, spās′kräft´), ***n.sing & pl.*** كەشتی ئاسمانی؛ كەشتی بۆشایی. (هەروەها " **space-ship** ").

**space flight,** فڕین بە بۆشایی ئاسماندا.

**spaceless** (spās′lis), ***adj.*** (١) بێ سنوور؛ بەر بەرەڵا. (٢) هیچ جێگەی نەگرتووە.

**spaceman** (spās′mən), ***n.*** (١) ئاسمانگەڕ؛ كەشتییەوانی كەشتی ئاسمانی. (٢) كەسێكە كە لە یەكێك لە ئەستێرەكانەوە هاتبێ بۆ سەرزەمین (لە چیرۆكی هەڵبەستی زانستیدا).

**space-ship** (spās′ship´), ***n.*** كەشتی ئاسمانی؛ كەشتی بۆشایی.

**space shuttle,** كەشتی ئاسمانی هاتوچۆكەر لە نێوان زەمین و ئێستگەی ئاسمانیدا (بۆ هێنان و بردنی ئاسمانگەڕەكان).

**space station,** ئێستگەی ئاسمانی؛ ئێستگەی بۆشایی.

**space suit,** دەستە جلی ئاسمانی (ئاسمانگەڕ لەبەری دەكات)؛ قاتە جلی ئاسمانگەڕ.

**space walk,** پیاسەی ئاسمانی؛ چوونەدەرەوەی ئاسمانگەڕ لە كەشتییەكەی لە ئاسماندا.

**spacial** (spā′shəl), ***adj.*** = **spatial.**

**spacing** (spās′iŋ), ***n.*** (١) بۆشایی جێهێشتن لە نێوان دوو شتی زنجیرەیەكدا (وەك ووشەی ناو ڕستە)؛ ڕێكخستنی زنجیرەیەك بە بەجێهێشتنی ئەم بۆشاییانە. (٢) بەرودوا ڕێكخستنی زنجیرە ڕووداو (لەڕووی كاتەوە). (٣) بۆشایی نێوان دوو شتی زنجیرەیەك (وەك ووشەكانی ڕستە).

**spacious** (spā′shəs), ***adj.*** (١) فراوان؛ گەورە (شوێن): ***(a ~ house, room, hall, etc.)***

(٢) بەرفراوان؛ خۆش گوزەران: ***(a ~ existence)***.

**spackle** (spā′k'l), ***n.*** هێلم یا گیراوەیەكە وەك هەویر (درزو كونی دیواری پێ پڕدەكرێتەوە).

***v.t.*** درزو كونی دیوار پڕكردنەوە بەم جۆرە گیراوەیە.

**spade** (spād), ***n.*** (١) بێل؛ بێڵچە. (٢) شتێكە لە بێڵچە بكات.

***v.t. & v.i.*** بێڵكاری كردن؛ هەڵكەندن بە بێل.

**call a spade a spade,** بە ڕێك و ڕاست ووتن بەبێ پێچ‌وپەنا؛ پێچ‌وپەنا تێ نەخستن؛ قسە لەڕووبوون.

**spade** (spād), ***n.*** (١) ماچە (كاغەزی یاری و قومار). (٢) *(pl.)*، دەستەیەك كاغەزی وەها. (٣) كاغەزێكی وەها.

**spadefish** (spād′fish´), ***n.*** ماسییەكی خڕكەلەی پەرەك تیژی دەریایییە.

**spadeful** (spād′fool´), ***adj.*** پڕ بێڵچەیەك.

**spadework** (spād′wûrk´), ***n.*** (١) بێڵكاری.

(٢) کاری ئامادەیی قورس؛ هەوڵو کۆششی زۆر (کە پێویستە بۆ ئامادەکردن یا گەڵاڵەکردنی کار).

**spadix** (spā′diks), *n.* جۆرە ڕووەکێکە لە نێرك دەچێ پەڕەیەکی وەك ڕەحەتی بە دەورییەوەیە.

**spaghetti** (spə-get′i), *n.* (١) سپاگێتی: خواردەمەنییەکی ئیتاڵییە وەك مەعکەرۆنی باریكو درێژ وایە. (٢) لوولەی دابڕکەر: لوولەیەکە تەلی ئەلەکتریکی ڕووتی تێ دەخرێ.

**spahi, spahee** (spä′hē), *n.* سپایی: سەربازی سوارەی لەشکری عوسمانی.

**spake** (spāk), *archaic past of* **speak.**

**spall** (spôl), *n.* تەڵەزمە بەرد.

*v.t.* شکاندن: تەڵەزم لێکردنەوە؛ پرواندن.

*v.i.* شکان: تەڵەزم لێبوونەوە؛ پروان؛ شەق بردن.

**span** (span), *n.* (١) (ا) بست؛ قولانج.

(ب) پێوانەیەکە بریتییە لە نۆ گرێ یا ئینج.

(٢) (ا) ڕادە؛ ئەندازە یا دووری نێوان دوو سنوور.

(ب) ماوە یا درێژی نێوان دوو کۆڵەکە یا پایە: *( the ~ of an arch)* .

(٣) ماوەی نێوان دوو پایە یا کۆڵەکە (پرد): *( a bridge of four ~s)* .

(٤) درێژی نێوان سەری هەردوو باڵی فڕۆکە.

(٥) ماوەیەکی کورت: *( the ~ of a life)* .

(٦) جووت (گا، هێستر، ئەسپ، کەر... هتد).

*v.t.* (١) بە بست پێوان. (٢) بە دەست دەورەدان (وەك لە پێوانا بە بست).

(٣) درێژبوونەوە بە سەردا (وەك پرد)؛ بەسەردا تێپەڕبوون؛ گرتنەوە:

*( The bridge ~s the river.)*

(٤) بەسەردا درێژکردنەوە (پرد)؛ پرد بە سەرەوە درووستکردن.

**span** (span), *archaic past tense of* **spin.**

**spandrel** (span′drəl), *n.* ئەو شوێنە سێگۆشەیییەی نێوان کەوانەی تاقێكو گۆشە ڕەستاوەکەی دەورێتی.

**spang** (spaŋ), *adv.* [Colloq.], بەتەواوی؛ بە بێ کەمو زیاد:

*( ~ in the middle of the table)*

**spangle** (spaŋ′g'l), *n.* (١) زێڕو زەنگیانە؛ زەنگیانە؛ مووروو؛ پوولەکە (بۆ جل ڕازاندنەوە). (٢) شتێك یا شوێنێکی بریقاوە: *( a ~ of sunlight)* .

*v.t.* بە پووڵەکە ڕازاندنەوە؛ زێڕو زەنگیانە پێوەکردن.

*v.i.* درەوشانەوە؛ بریقانەوە

-spangly *(adv.).*

**Spaniard** (span′yẽrd), *n.* ئیسپانی: هاوولاتییەکی ئیسپانیا؛ کەسێکی ئیسپانی.

**spaniel** (span′yəl), *n.* (١) جۆرە سەگێکی قاچ کورتی تووك لوولو درێژی گوێ زلو داکەوتووی کلك کورتە. (٢) کەسێکی ملکەچی مەراییکەری حەز لە نۆکەری کەر.

**Spanish** (span′ish,), *adj.* ئیسپانی (گەل، کلتوور، زمان).

*n.* ئیسپانی؛ زمانی ئیسپانی.

**the Spanish,** ئیسپانییەکان.

**Spanish-American** (span´ish-ə-mer′ə-kən), *adj.* (١) ئیسپانی-ئەمەریکی: تایبەتی بە وولاتە ئیسپانی ئەمەریکاییەکانو گەلەکانیان (وەك مەکسیكو ئەمەریکای ناوەڕاست).

(٢) ئیسپانی-ئەمەریکی: تایبەتی بە ئەمەریکایی بنەچە ئیسپانی.

*n.* (١) هاوولاتییەکی وولاتە ئیسپانییە ئەمەریکاییەکان.

(٢) ئەمەریکایی بنەچە ئیسپانی.

**Spanish fly,** قالونچەیەکی سەوزە وورد دەهاڕێنتو بۆ دەرمان بەکاردێت.

**Spanish Inquisition,** دادگای پشکنینو لێکۆڵینەوەی ئیسپانی: دادگایەکی کاسۆلیکی بوو لە ئیسپانیا لە سەدەی پانزە بۆ سزادانی لە ئاین وەرگەڕاوەکان کە زۆر بە توندوتیژی ناسرابوو.

**Spanish rice,** برنجی ئیسپانی: قوبڵی برنجی بە تەماتەو پیازو بیبەری سەوزی جنراوو بەهارات لێنراو.

**Spanish mackerel,** جۆرێکە لە ماسی.

**spank** (spaŋk), *v.t.* بە قنگدا کێشان یا ماڵین (بەتایبەتی منداڵ بۆ سزادان): *( She ~s her children when they misbehave.)* .

*v.i.* بە پەلە ڕۆیشتن؛ بۆ تێتەقاندن؛ بە تیژو بە قنجی ڕۆیشتن.

*n.* بە قنگدا ماڵین یا کێشان.

**spanker** (spaŋ′kẽr), *n.* (١) بە قنگدا کێشەر.

(٢) [Colloq.]، ئەسپی خێرا؛ ئەسپی تیژڕەو.

(٣) بایەوانی دواوە (کەشتییەوانی).

**spanking** (spaŋ′kiŋ), *adj.* (١) خێرا؛ تیژڕەو.

(٢) خێراو بەهێز (با، سروە). (٣) [Colloq.]، چاكو گەورەو بەتینو بەهێز.

**spanner** (span′ẽr), *n.* [British], سپانە.

**span-new** (span′nōō′, span′nū′), *adj.* [Dial.], = **brand-new.**

**spar** (spär), *n.* کانزایەکی بریقەدارە کە بە ئاسانی پەڕە پەڕە دەکرێ.

**spar** (spär), *n.* (١) ستوون یا داری بایەوان (کەشتییەوان).

(٢) پەراسوی ڕاگری باڵی فڕۆکە لە باری درێژی.

**spar** (spär), *v.i.* (١) بە چنگ شەڕکردن (کەڵەشێر).

(٢) شەڕە بۆکس کردن؛ بۆکسبازی کردن.

(٣) شەڕە دەنووك کردن (مەجاز)؛ مشتومڕکردن؛ پلار هاویشتن؛ لە یەك خوێندن.

*n.* (١) بۆکسبازی؛ شەڕە بۆکس.

(٢) مشتومڕ؛ شەڕە دەنووك (مەجاز)؛ پلار هاویشتن.

**sparable** (spar′ə-b'l), *n.* بزماری بێ سەری بچووك (پێڵاودروو بەکاری دێنێت).

**spare** (spâr), *v.t.* (١) بەخشین؛ نەکوشتن؛ ڕزگارکردن؛ هێشتنەوە:

*( to ~ someone's life)*

(٢) ناخۆشی نەدانە بەر؛ بە تووشەوە نەکردن:

*( We have ~d you the trouble.)*

(٣) گلدانەوە؛ ڕاگرتن؛ بەکار نەهێنان: *( We will ~ no effort.)*

(٤) توانای دەست لێ هەڵگرتن بوون:

*( I can't ~ the money or the time.)*

*adj.* (١) یەدەك؛ زیادە: *( a ~ room; a ~ tire, part, etc.)* .

(٢) بەتاڵ (کات)؛ زیادە: *( ~ time)* .

(٣) کەم: *( a ~ meal)* .

(٤) لەڕ؛ لەڕولاواز؛ ڕەقەڵە: *( a tall, ~ man)* .

*n.* (١) تایەی سپێر: *( I have a ~ in the trunk.)* .

(٢) (ا) خستنی هەر دە نیشانەکەی یاری بۆلینگ بە دوو یاری

(ب) خاڵی گیراو بەم لێدانو خستنە.

-sparely *(adv.)*; spareness *(n.).*

**spare-rib** (spâr′rib´), *n.* پەراسوی بەراز (کە زۆربەی گۆشتەکەی لێ دەکرێتەوە ئەوسا لێدەنرێ).

**sparge** (spärj), *v.t. & v.i.* (١) لێ هەڵپرژان.

(٢) شڵەقاندن یا ژەندنی شلە بە تێکردنی هەوای پەستێنراو.

**sparing** (spâr′iŋ), *adj.* (١) گیر؛ دەست قووچاو؛ پیسکە.

(٢) کەم. (٣) بەخشندە.

-sparingly *(adv.).*

**spark** (spärk), *n.* (١) پریشك؛ پزیسك؛ پرژ. (٢) ترووسکە.

(٣) تۆزێك؛ ئەختێك؛ تۆسقاڵێك: *( a ~ of interest)* .

(٤) زیتی؛ وریایی؛ زیندوویی: *( There is no ~ in him.)*

*v.i.* (١) پریشکدانەوە؛ پرژلێبوونەوە.

(٢) پریشك لێبوونەوە (مەجاز)؛ بە جۆشەوە بەدەنگەوەهاتن.

*v.t.* بزواندن؛ جموجووڵ تێخستن؛ پریشك لێ هەڵساندن.

**spark** (spärk), *n.* (١) لاوێکی شۆخ؛ گەنجێکی قۆز؛ جوامێر.

(٢) دڵدار؛ یار.

*v.t. & v.i.* [Colloq.], دڵداری لەگەڵ کردن؛ چاو باشقاڵی لەگەڵ کردن.

**spark arrester,** (١) پریشکبڕ (لە دووکەڵ کێشدا).

(٢) پریشك كوژ (كارەبا).

**spark coil,** كۆیلی پریشك لێبووەوە.

**spark gap,** بۆشایی دازنەی كارەبا

**sparkle** (spär′k'l), *v.i.* (١) پریشكدانەوە؛ پرژدانەوە

(٢) پرشنگدانەوە؛ درەوشانەوە؛ بریقەدانەوە.

(٣) شەوقدانەوە (مەجاز)؛ زرنگی و دانایی پیشاندان: ***( Her wit ~d.)*** .

(٤) كەف و كوڵ لێ هاتنەدەرەوە (شامپانیا، كۆكا كۆلا).

*v.t.* تیف تیفەدان؛ بریقە لێ هەڵساندن؛ شەوق پێدانەوە.

*n.* (١) پریشك. (٢) بریقە؛ پرشنگ؛ تیف تیفە؛ درەوشانەوە.

(٣) كفوكوڕ؛ زیندوویتی؛ گورج وگۆڵی. (٤) كەف وكوڵ (شامپانیا، كۆكا كۆلا).

**sparkler** (spär′klēr), *n.* (١) (ا) كەسێكی زیت و بە كفوكوڕ.

(ب) [Colloq.]. چاوی بریقاوە (٢) فیشەكەشێتەی هێواش و پریشكدەرەوە.

(٣) [Colloq.]. ئەڵماس.

**sparkling** (spär′kliŋ), *adj.* (١) درەوشاوە؛ بریقاوە؛ پرشنگدار؛ تیف تیفەدار (٢) بە كفوكوڕ؛ زیت؛ گورج وگۆڵ؛ زرنگ.

(٣) بە كەف وكوڵ (شامپانیا، كۆكا كۆلا).

**spark plug,** پلاكی ئوتومبیل و مەكینەی تر.

**sparling** (spär′liŋ), *n.* جۆرە ماسییەكی ئەورووپاییە.

**sparring partner,** هاومەشقكەری بۆكسباز.

**sparrow** (spar′ō), *n.* پاساری؛ چۆلەكە پاساری؛ چۆلەكە

**sparrow-grass** (spar′ə-gras´), *n.* [Colloq.]. = asparagus.

**sparrow hawk,** واشە؛ جۆرە هەڵۆیەكی بچووكە.

**sparse** (spärs), *adj.* تەنك (قژ، ریش، دەغڵودان... هتد)؛ پرش وبلاو؛ كەم؛ شاش: ***( a ~ beard, crop, population, etc.)*** .

**-sparsely** *(adv.)*; sparseness *(n.)*.

**sparsity** (spär′sə-ti), *n.* كەمی؛ پرش وبلاوی؛ شاشی؛ تەنكی (چڕی).

**Spartan** (spär′t'n), *adj.* (١) سپارتەیی: تایبەتی بە " سپارتە " ی كۆن و كەل و كلتوورەكەی. (٢) دلێر؛ بەجەرگ؛ ئازا؛ جەنگاوەر؛ توندوتیژ؛ ساكار؛ سادە؛ سەخت؛ بەرگەی ناخۆشی گر؛ پارە بەفیڕۆنەدەر؛ گیر.

*n.* (١) هاوولاتییەكی " سپارتە " ی كۆن.

(٢) كەسێكی دلێرو توندوتیژو گیرو بێباك و بەجەرگ و سادەو پارە بەفیڕۆنەدەر.

**-Spartanism** *(n.)*.

**spar varnish,** بۆیاخی تەختەو داری ئاودانەدەر یا ئاوبڕ.

**spasm** (spaz'm), *n.* (١) بەگیروەستانی ماسولكە؛ كرژبوونی ماسولكە؛ مووچڕك؛ دەمارگیران. (٢) جم وجوولێكی لەپڕو نائاسایی؛ جۆش؛ هەست هاتنەجۆش؛ جۆش هەڵسان؛ جرت وفرت؛ خرۆشان.

**spasmodic** (spaz-mod′ik), *adj.* (١) مووچڕكی؛ لە بەگیروەستان یا كرژبوونی ماسولكە دەچێ

(٢) پچڕپچڕ؛ كوتوپڕ؛ ناوبەناوو لەپڕ؛ ناوبەناو ***( ~ rifle fire)*** .

(٣) زوو هەڵچوو؛ لە پڕ خرۆشاو (هەست، مرۆڤ)؛ شێتەو ژیرە.

**-spasmodical** *(adj.)*; spasmodically *(adv.)*.

**spastic** (spas′tik), *adj.* (١) تایبەتی بە كرژبوون یا بەگیرهاتنی ماسولكە (٢) بەگیرهاتوو؛ كرژ (٣) ماسولكەكانی كرژ دەبن یا بەگیر دێن.

*n.* كەسێكی ماسولكە كرژبوو یا بەگیرهاتوو؛ كەسێكی ماسولكە ووشك بوو یا ئیفلیج

**-spastically** *(adv.)*.

**spat** (spat), *n.* [Colloq.]. (١) زللە؛ شەپازلە؛ شەقازلە

(٢) دەمەقاڵێ؛ شەڕە قسە؛ ناكۆكی.

*v.i.* (١) زللەلێدان؛ شەپازلەلێدان (٢) مشت ومڕكردن؛ شەڕە قسە كردن؛ دەمەقاڵێ بوون

*v.t.* زللەلێدان؛ شەقازلەلێدان

**spat** (spat), *n.* پارچەیەك چەرم یا كاڵایە لە لاسەرووی پێڵاوو قنگە پاژنەكەیەوە دەپێچرێ بۆ پاراستنی.

**spat** (spat), *alternative past tense and p.p. of* spit.

**spat** (spat), *n.* (١) گەرا یا هێلكەی گوێچكەماسی.

(٢) (ا) بەچكە گوێچكەماسی بەگشتی. (ب) بەچكە گوێچكەماسی

*v.i.* گەرادانان (گوێچكەماسی)؛ گەراخستن.

**spate** (spāt), *n.* (١) لافاوی لەپڕ. (٢) ڕەهێڵە؛ شەستەباران.

(٣) لافاو هەڵسان: ***( The river is in ~.)*** .

(٤) لێشاو (ووشە، ووتە).

**spathaceous** (spə-thā′shəs), *adj.* پەڕەیەكی وەك ڕەحەتی بەدەوری گوڵەكەیەوەیە.

**spathe** (spā*th*), *n.* پەڕەیەكی وەك ڕەحەتی بە دەوری هەندێ گوڵەوە كە لە ئێرك دەچن.

**spathose** (spath′ōs), *adj.* = **spathaceous.**

**spatial** (spā′shəl), *adj.* (١) تایبەتبە جێگە؛ هی جێ یا شوێن.

(٢) بوونی هەیە لە جێگەدا؛ جێگەگرتوو.

-spatially *(adv.)*.

**spatio-temporal** (spā´shi-ō-tem′pēr-əl), *adj.* جێگەیی- كاتی: بوونی هەیە لە جێگەیش و كاتیشدا.

**spatter** (spat′ēr), *v.t.* (١) لێ هەڵپرژان (ئاو، قوڕاو، بۆیە، شلە... هتد)؛ پیس كردن (بە لێ هەڵپرژان):

***( The car ~ed us with mud as it passed.)***

(٢) ئاوڕشێن كردن؛ پرش وبلاوكردنەوە: ***( to ~ water)*** .

(٣) ئاوڕژاندن؛ ئاو پیس كردن؛ بەدناوكردن؛ لەكەداركردن.

*v.i.* (١) فیچقەكردن. (٢) بارین؛ بە پرژ هاتنەخوارەوە؛ پرژانە خوارەوە.

*n.* (١) هەڵپرژان؛ ئاوپرژێن؛ ئاوڕشێن. (٢) دەنگی لێ هەڵپرژان.

(٣) (ا) پرژ؛ دڵۆپ؛ پریشك؛ جێ پرژ؛ پەڵە. (ب) ئەختێك؛ كەمێك؛ تۆزێك

***( a ~ of applause)***

**spatter-dock** (spat´ēr-dok′), *n.* شلێری ئاوی.

**spatula** (spach′oo-lə), *n.* كەوگیر؛ ئامێرێكی دەم پانە وەك كەوگیر شتی پانكەڵەی ئاو تاوەی پێ هەڵدەگێڕێتەوە وەك هێلكەوڕۆن؛ ئامێرێكە وەك چەقۆی دەم پان و كوڵ (بۆ شت تێكەڵاوكردن).

**spavin** (spav′in), *n.* نەخۆشییەكە تووشی ڕەفیسكی ئەسپ دەبێ و دەبێتەهۆی شەلین.

-spavined *(adj.)*.

**spawn** (spôn), *v.t. & v.i.* (١) گەرادانان (ماسی، بۆق، گوێچكەماسی)؛ گەراخستن. (٢) خستنەوە (بەچكەی زۆر) (لەڕووی سووكییەوە)؛ لێبوونەوە؛ هێنانە دنیاوە؛ هێنانەبەر.

*n.* (١) گەرا (ماسی، گوێچكەماسی، بۆق)؛ هێلكە ماسی.

(٢) بەچكە (لەڕووی سووكییەوە)؛ نەوە. (٣) ئەنجام؛ بەرهەم؛ بەر

**spay** (spā), *v.t.* نەزۆك كردن (بە دەرهێنانی هێلكەدان بەتایبەتی سەگ و پشیلە)؛ دەرهێنانی هێلكەدانی گیاندار: ***( to ~ a cat)*** .

**speak** (spēk), *v.i.* (١) قسەكردن؛ ئاخاوتن؛ دووان.

(٢) دەربڕین؛ ووتن؛ بێژان: ***( Actions ~ louder than words.)*** .

(٣) ووتاردان؛ ووتار خوێندنەوە.

(٤) گفتوگۆكردن؛ دووان.

(٥) دەنگ لێبوونەوە؛ دەنگدانەوە: ***( The guns ~ sharply.)***

*v.t.* (١) دەربڕین؛ بێژان:

***( He ~s the sentiments of us all.)***

(٢) قسەپێكردن؛ پێ دووان؛ قسەكردن: ***( She ~s several languages.)***

(٣) ووتن. (٤) قسە بۆ كردن؛ ووتار بۆ دان.

so to speak, دەتوانین وا بڵێین؛ دەتوانرێ بخرێتە ئەو قاڵبەوە.

speak for, (١) بەناوی كەسێك یا كۆمەڵێكەوە قسەكردن؛ قسەكردن لەباتی.

(٢) داواكردن؛ قۆرخ كردن؛ گرتن:

***( You can't ask her to marry you because she is spoken for)***

speak of, لێ دووان؛ ناوهێنان؛ باس كردن؛ دەربارە دووان؛ قسە لێكردن.

speak one's mind, ڕای خۆ دەربڕین بە ئاشكرا.

speak out (or up), (١) بە دەنگی بەرز قسەكردن.

(٢) به ئاشكرا قسەكردن؛ بە بێ ترس و دڵەلەرزێ ڕا دەربڕین؛ لەڕوو قسەكردن.

**speak well for,** چاكە وتن؛ لای چاكە دەرخستن.

**to speak of,** شایانی باسە

**speakeasy** (spēk′ēz´i), *n.* [Slang], مەیخانەی قاچاخ.

**speaker** (spēk′ēr), *n.* (١) قسەكەر؛ ڕێژەر؛ دوێنەر؛ دوواندەر.

(٢) وتاربێژ؛ وتارخوێن؛ وتاربێژی لێهاتوو.

(٣) [S-]، سەرۆكی ئەنجومەنی یاسایی؛ سەرۆكی پەرلەمان (بەتایبەتی كۆنگرێسی ئەمەریكا كە پێی دەوترێ: " Speaker of the House ").

(٤) پەرتووكی ڕەوانبێژی. (٥) loudspeaker .

**speakership** (spēk′ēr-ship´), *n.* سەرۆكایەتی پەرلەمان؛ سەرۆكایەتی كۆڕ؛ پلەوپایەی سەرۆكی پەرلەمان.

**speaking** (spēk′iŋ), *adj.* (١) (ا) قسەكەر.

(ب) بە زمانێكی تایبەتی قسەكەر یا دروواو: *( English- ~ countries.)* .

(٢) حوان دەربڕ یا پیشاندەر؛ باش دەرخەر: *( a ~ face)* .

(٣) لە شتە ڕاستەقینەكە دەچێ؛ لێچوو: *( a ~ likeness)* .

*n.* (١) ئاخاوتن؛ دووان؛ قسە؛ قسەكردن.

(٢) وتاردان؛ وتار خوێندنەوە. (٣) وتار؛ شتی بێژراو.

**on speaking terms,** قسەیان هەیە پێكەوە؛ قسەیان نەبڕیوە؛ قسە دەكەن؛ ئاشت‌وماشیان نەكردووە:

*( They have not been on speaking terms for a year.)*

**speaking tube,** بۆری ئاخاوتن: بۆ دووان لە نێوان ژوورەكانی خانوویەكدا

**spear** (spêr), *n.* (١) ڕم؛ نێزە. (٢) سەرە ڕم؛ نووكی نێزە.

(٣) ڕمی ڕاوەماسی. (٤) spearman (٥) تاڵە گیای درێژ؛ چڵە گیا.

*v.t.* (١) ڕم لێدان؛ نێزە پێداكردن. (٢) ماسی گرتن بە ڕمی ڕاوەماسی.

*v.i.* (١) پێداچوون وەك ڕم؛ سمین.

(٢) چڵی تازە دەركردن؛ چرۆكردن و بوون بە چڵێكی درێژ.

**spear-fish** (spêr′fish´), *n.* ڕمە ماسی: ماسییەكی دەریایی گەورەیە لموزێكی درێژی هەیە لە ڕم دەكات.

**spearhead** (spêr′hed´), *n.* (١) سەرە ڕم؛ نووكی نێزە.

(٢) پێشەنگ (لەشكر، هێرش، كار)؛ ڕابەر (كار)؛ سەری ڕم (مەجاز).

*v.t.* وەك سەری ڕم پێشەنگی كردنی هێرشێك یا كارێك:

*( The paratroopers ~ed the invasion.;*
*He ~ed the reorganization of the company.)*

**spearman** (spêr′mən), *n.* ڕمبار؛ ڕم هاوێژ؛ ڕم هەڵگر.

**spearmint** (spêr′mint´), *n.* نەعنا: جۆرێكە لە نەعنا؛ ڕۆنی نەعنا.

**spear side,** باوكی؛ لەلای باوكییەوە؛ لە بنەچەی باوكەوە:

*( the ~ of the family)*

(بەراووردی كە لەگەڵ وشەی: " distaff side ").

**special** (spesh′əl), *adj.* (١) تایبەتی؛ جیا:

*( The play requires a ~ stage.)*

(٢) نائاسا؛ سەرئاسا؛ تایبەتی.

(٣) نزیك (برادەر)؛ تایبەتی: *( a ~ friend)* .

(٤) تایبەتی (بە كەسێك، ڕێكەوتنێك، مەبەستێك... هتد):

*( by ~ permission; a ~ edition of the newspaper)*

(٥) دیاریكراو؛ تایبەتی.

*n.* (١) شتێك یا ڕووداوێكی تایبەتی. (٢) بەرنامەیەكی تەلەفزیۆنی یا ڕادیۆی تایبەتی. (٣) ژمارەیەكی تایبەتی ڕۆژنامە یا گۆڤار.

(٣) شتێكی بەتایبەتی گیراو (شەمەندەفەر، پاس ... هتد).

(٤) نرخ داشكانێكی تایبەتی بە فرۆتەنییەك.

**special delivery,** پۆستەی خێرا؛ پۆستەی تایبەتی.

**specialism** (spesh′əl-iz'm), *n.* (١) پسپۆڕی؛ شارەزایی لە ڕشتەیەكی تایبەتیدا. (٢) ڕشتەی پسپۆڕی؛ ڕشتەی شارەزایی؛ ڕشتە.

**specialist** (spesh′əl-ist), *n.* پسپۆڕ؛ شارەزای ڕشتەیەكی تایبەتی؛ كارزان: *( an eye ~ ; a ~ in gynecology)* .

**speaciality** (spesh′i-al´ə-ti), *n.* (١) تایبەخۆی تایبەتی؛ نیشانەی تایبەتی. (٢) (*pl.*): چۆنێتی؛ ووردە تایبەخۆی شتێك یا بارێك؛ ووردە تایبەتییەكانی شتێك. (٣) specialty .

**specialization** (spesh´əl-i-zā′sh-ən), *n.* (١) پسپۆڕی؛ شارەزایی بوون یا پەیداكردن لە ڕشتەیەكی تایبەتیدا؛ ڕشتە

| His (field of) ~ is biology. |

(٢) (ا) ڕاهاتنی مرۆڤ یا زیندەوەر بە دەوروبەری تازە؛ ڕاهاتنی ئەندامی لەش بە ئەركی تازە. (ب) زیندەوەر یا مرۆڤی وەها ڕاهاتوو.

**speacialize** (spesh′ə-līz´), *v.t.* (١) ناونووس كردن؛ دیاریكردن؛ ناوهێنان بەتایبەتی نەك بە گشتی: *( ~ your accusation)* .

(٢) (ا) لە ڕشتەیەكی تایبەتیدا پسپۆڕی پەیداكردن: *( He ~d his study.)* .

(ب) بۆ مەبەستێك یا ئامانجێكی تایبەتی كۆشش كردن. (٣) ڕاهێنان

(٤) ناونووس كردنی چەك گۆڕەرەوە یا پارەپێدراو.

*v.i.* (١) پسپۆڕی پەیداكردن لە ڕشتەیەكدا؛ شارەزابوون لە شتێكدا:

*( He ~s in languages, sales, medicine, management, etc.)*

(٢) ڕاهاتن بە ئەرك و بارو دەوروبەری تازە (ئەندامی لەش).

**specially** (spesh′əl-i), *adv.* (١) بۆ مەبەستێكی تایبەتی؛ هەر بۆ ئەوە: *( I came here ~ to see you.)* .

(٢) بەتایبەتی.

**specialty** (spesh′əl-ti), *n.* (١) تایبەخۆی تایبەتی؛ تایبەخۆ؛ نیشانەی تایبەتی. (٢) ڕشتە؛ پسپۆڕی؛ شارەزایی لە ڕشتەیەكی تایبەتیدا.

*( Art is her ~ .)*

(٣) تایبەتێتی.

(٤) شتێكی خۆش و نایاب و بەتایبەتی كراو (لەچاو توخمەكەیدا):

*( What is this restaurant ~ ?; Fried chicken was her mother's ~ .)*

(٥) قۆنتەرات یا پەیمانێكی لۆك كراو.

**specie** (spē′shi), *n.* پارەی ووردە.

**in specie,** (١) بە پارەی ووردە

(٢) هەمان جۆر؛ بە هەمان شێوە (ڕەفتار):

*( He was ready to return insult in ~ .)*

**species** (spē′shiz), *n.* (١) (ا) توخم؛ ڕەگەز. (ب) ئەندامی توخمێك یا ڕەگەزێك. (٢) جۆر؛ چەشن؛ بابەت.

(٣) [Obs.]، ڕووخسار؛ شێوە؛ ڕووالەت؛ شێوەی هاتنە بەرچاو.

(٤) [Obs.]، specie .

(٥) (ا) شێوەی شەراب و نانە ڕەقەی شێوی قوربانی (كڵێسەی كاسۆلیكی).

(ب) ئەم شەرابە یا نانە ڕەقەیە

**the species,** ڕەگەزی مرۆڤ؛ توخمی ئادەمیزاد.

**specific** (spi-sif′ik), *adj.* (١) تایبەتی؛ وورد؛ دیاریكراو؛ بێ كەم و زیاد: *( Be ~ in your description.; ~ order, directions, instructions, etc.; a ~ use of the word; for no ~ reason)*

(٢) تایبەتی بە ڕەگەزێك یا توخمێك: *( ~ characteristics)* .

(٣) تایبەخۆی شتێكە.

(٤) هی جۆرێكی تایبەتی؛ تایبەتی؛ هی بابەتێكی تایبەتی؛ جۆری؛ بابەتی.

(٥) (ا) دەرمانی نەخۆشییەكی تایبەتییە؛ چارەیەكی تایبەتییە.

(ب) لە میكرۆبێكی تایبەتییەوە تووش دەبێ یا دەكەوێتەوە.

*n.* (١) دەرمانێكی تایبەتی بە نەخۆشییەك.

(٢) شتێكی تایبەتی بە بارێك یا مەبەستێك.

(٣) (*pl.*)، چۆنێتی؛ ووردە تایبەخۆكانی بارێك، ڕووداوێك یا مەسەلەیەك:

*( I don't know the ~s of the case.)*

**specifically** (spi-sif′i-k'l-i, spi-sif′ik-li), *adv.* بەتایبەتی؛ بەشێوەیەكی تایبەتی؛ بە بێ كەم و زیاد.

**specification** (spes´ə-fi-kā′shən), *n.* (١) دیاریكردن؛ ناونووس كردن؛ تایبەتی كردن. (٢) (*pl.*)، چۆنێتی؛ تایبەخۆكانی شتێك بە

**spoiler** (spoil′ẽr), *n.* (١) تالانکەر؛ دز (٢) شتێکە خواردەمەنی بترشێنێ یا شت لە کەڵك بخات. (٣) تەبەقێکی درێژی سەر باڵی فڕۆکەیە (یارمەتی فڕین دەدات). (٤) خۆشی لە خەڵك تێکدەر (بەتایبەتی ئاهەنگ و ڕابواردن)؛ شت تێکدەر؛ گێرەشێوێن.

**spoilsman** (spoilz′mən), *n.* هەلپەرستێکە کە یارمەتی حیزبێکی سەرکەوتوو دەدات بۆ دەسکەوتی خۆی.

**spoilsport** (spoil′spôrt′, spoil′spōrt′), *n.* خۆشی لە خەڵك تێکدەر

**spoils system,** بەش کردنی پلەوپایەی میری لەنێوان ئەندامانی حیزبی براوەدا؛ هەر وەك تالانی.

**spoilt** (spoilt), *alternative past tense and p p. of* spoil.

**spoke** (spōk), *n.* (١) تەل پێچکە (پاسکیل). (٢) پلەی پەیژە (٣) یەکێك لەو دەسکانەی سەریان دەرهێناوە لە چەرخی ئاژووتنی کەشتییەوە. (٤) شیشێکە دەکرێ بە پێچکەیەکدا بۆ ئەوەی نەخولێتەوە.

*v.t.* (١) تەل لە پێچکەوە کردن. (٢) شیش کردن بە پێچکەدا بۆ ئەوەی نەخولێتەوە

**put a spoke in a person's wheel,** پیلان پووچ کردن؛ پیلان تێکدانی کەسێك

**spoke** (spōk), *past tense or archaic p.p of* speak.

**spoken** (spō′kən), *past participle of* speak.

*adj.* (١) بێژراو؛ بە زار ووتراو؛ ووتراو. (٢) بەشێوەیەکی تایبەتی بێژراو: ***( harsh- ~ ; soft- ~ )*** .

**spokesman** (spōks′mən), *n.* قسەکەر لە ناوی کۆمەڵ، میری، یا دەستەیەکەوە؛ دەم ڕاستی کۆمەڵ، دەستە، حیزب، یا کۆڕێك.

**spokeswoman** (spōks′woom′ən), *n.* قسەکەری ژن بە ناوی کۆمەڵ یا دەستەیەکەوە.

**spoliate** (spō′li-āt′), *v.t.* تالان کردن؛ ڕووتکردنەوە.

**spoliation** (spō′li-ā′shən), *n.* (١) تالان کردن (بەتایبەتی کەشتی بێ لایەن لە کاتی جەنگدا)؛ ڕووتکردنەوە؛ دەستبەسەرداگرتن (٢) تالان کران؛ ڕووتکرانەوە؛ دەستبەسەرداگیران (٣) فەوتاندن یا گۆڕین (بەتایبەتی بەڵگەی یاسایی)؛ لەناوبردن؛ بەتەواوی تێکدان

**-spoliator** ***(n.)***.

**spondaic** (spon-dā′ik), *adj. Also* spondaical. تایبەتی بە " سپۆندی " (ووشەی داهاتوو ببینە).

**spondee** (spon′dē), *n.* سپۆندی: دوو برگەی یەك لە دوای یەکی درێژ یا هێز لەسەری هۆنراوەیە وەك ووشەی: " **heartbreak** " .

**spondylitis** (spon′də-lī′tis), *n.* ئاوسانی بڕبڕەی پشت

**sponge** (spunj), *n.* (١) ئیسفەنج: گیانداڕێکی دەریایی ئەبزۆکە بە کۆمەڵ دەژی (٢) ئیسفەنج. (٣) شتێکی وەك ئیسفەنج: (ا) تۆپەڵە سارغی نەشتەرکاری. (ب) جۆرە کێکێکی نەرمە وەك ئیسفەنج. (ج) هەویر. (د) کانزای وەك پلاتین. (٤) مشەخۆر؛ مفتخۆر؛ لاکوت؛ هەوانتەخۆر (٥) [Colloq.]، چاوچنۆس؛ چاوبرسی؛ زۆرخۆر؛ زۆرخۆرەوە (٦) **sponge bath**

*v.t.* (١) سڕین یا پاکردنەوە بە ئیسفەنج. (٢) ( **~ out; ~ off; ~ away** )، نەهێشتن؛ سڕینەوە؛ لابردن. (٣) ( **~ up** )، هەڵمژین بە ئیسفەنج یا هەر وەك بە ئیسفەنج. (٤) لاکوتی کردن؛ مفتخۆری کردن؛ مشەخواردن.

*v.i.* (١) ئیسفەنج لە دەریا کۆکردنەوە. (٢) هەڵمژین وەك ئیسفەنج. (٣) ( **~ on** )، لاکوتی بەسەرەوە کردن؛ مفت خواردن؛ مشە خواردن.

**throw (or toss) in the sponge,** [Colloq.], دەستهەڵگرتن؛ وازهێنان؛ بەزین؛ بۆڕدان؛ کۆڵدان.

**sponge bath,** خۆشتن بە ئیسفەنج یا پەڕۆی تەڕ بەبێ ئاو بەرکەوتن.

**sponge cake,** کێکی ئیسفەنجی: کێکێکی نەرمی کون کونە

**sponger** (spun′jẽr), *n.* (١) ئیسفەنجی دەریا کۆکەرەوە (مرۆڤ، کەشتی). (٢) بە ئیسفەنج پاکەرەوە یا خاوێنکەر. (٣) مشەخۆر؛ لاکوت؛ مفتخۆر.

**sponginess** (spun′ji-nis), *n.* ئیسفەنجێتی؛ وەك ئیسفەنج وابوون؛ نەرمی.

**sponging house,** گرتووخانەی قەرزاران: شوێنێکە جاران لە ئینگلتەرەدا قەرزارانی تێ دەخرا هەتا قەرزەکەیان دەدایەوە یا دەخرانە بەندیخانەوە.

**spongy** (spun′ji), *adj.* ئیسفەنجی: (ا) نەرم؛ سووك؛ لاستیکی. (ب) کون کون (ج) هەڵمژ.

**sponsion** (spon′shən), *n.* (١) دەستەبەری؛ دەستەبەری کردن. (٢) بەڵێن (بەتایبەتی کە لە باتی کەسێکی تر درابێ). (٣) بەڵێنێکە دەدرێ یا ئەرکێکە دەبینرێ لەلایەن کەسێکەوە بە ناوی وڵاتەکەیەوە بێ ئەوەی ئەو دەسەڵاتەی هەبێ.

**sponson** (spon′sən), *n.* (١) ڕەفەی قەراغی کەشتی و دەبابەیە بۆ تۆپ لەسەر دانان. (٢) دەفرێکی پڕ هەوایە بە چوارچێوەی فڕۆکەی ئاوییەوە بۆ لەنگەرگرتن.

**sponsor** (spon′sẽr), *n.* (١) دەستەبەر؛ کەفیل. (٢) چاودێری منداڵ لە ئاهەنگی بوون بە خاچ پەرست و لە ناو هەڵکێشاندا بۆ پیرۆزی. (٣) سەرپەرشت؛ مرۆڤ یا دەسگای سەرپەرشتکەر؛ چاودێریکەر؛ بەڵێن بۆ دەر. (٤) خاوەن پێشنیار (پەرلەمان، ڕێکخراو، کۆڕ)؛ پێشکەشکەری پێشنیار. (٥) سەرپەرشتی بەرنامە: دەسگایەکی بازرگانییە سەرپەرشتی بەرنامەی تەلەفزیۆن یا ڕادیۆ دەکات بە کڕینی کات بۆ ڕیکلامکردن بۆ فرۆتەنییەکانی لە کاتی بڵاوکردنەوەی بەرنامەکەدا.

*v.t.* سەرپەرشتی کردن؛ چاودێری کردن:
***( to ~ a television program ; to ~ a resolution in Congress; to ~ a foreign student)***

**sponsorship** (spon′sẽr-ship′), *n.* سەرپەرشتی؛ چاودێری؛ سایە.

**spontaneity** (spon′tə-nē′ə-ti), *n.* (١) سەرپێیەتی؛ لەخۆوەیی؛ لەبەربوورەیی؛ بێ خۆ ئامادەکردن. (٢) کارێکی سەرپێیی.

**spontaneous** (spon-tā′ni-əs), *adj.* (١) سەرپێیی؛ لەبەربوورە؛ بێ ئامادەکردن؛ بێ بیرلێکردنەوە: ***( a ~ speech, remark, act, etc.)*** (٢) خۆکرد؛ لە خۆوەکراو بە بێ یارمەتی کەسی تر؛ هەر لە خۆوە؛ خۆیی ***( ~ movement characteristic of living things)*** (٣) لە خۆوە ڕواو؛ نەنێژراو؛ کێوی.

**-spontaneously** ***(adv.)***; **spontaneousness** ***(n.)***.

**spontaneous combustion,** سووتانی خۆیی؛ لەخۆوە سووتان

**spontoon** (spon-tōōn′), *n.* ڕمێکی کورت؛ ڕمۆکە.

**spoof** (spōōf), *n.* (١) پەند؛ تەشقەڵە؛ فریو؛ هەڵفریوان؛ ساختە؛ گاڵتەبازی. (٢) لاسایی بە گاڵتەپێکردنەوە (بەرنامەی تەلەفزیۆنی ... هتد)؛ لاساییکردنەوە؛ داشۆرین؛ لاقرتێ.

*v.t. & v.i.* (١) هەڵفریواندن؛ تەشقەڵە پێکردن؛ پەند پێدان؛ ساختە لەگەڵ کردن. (٢) لاساییکردنەوە بە گاڵتەپێکردنەوە (بەرنامەی تەلەفزیۆن، فیلم )؛ داشۆرین؛ لاقرتێ پێکردن.

**spook** (spōōk), *n.* [Colloq.], (١) خێو. (٢) سیخوڕ؛ جاسووس.

*v.t.* (١) سەردانی خێو بۆ شوێنێك. (٢) تۆقاندن؛ زراوبردن؛ داچڵەکاندن و ترساندن (ڕەشەووڵاخ).

**spooky** (spōōk′i), *adj.* (١) (ا) خێوی؛ لە خێو دەچێ. (ب) ترسناك؛ سامناك؛ سامدار: ***( a ~ place, atmosphere, sound, etc.)*** (٢) سرك؛ زوو دادەچڵەکێ.

**-spookily** ***(adv.)***; **spookiness** ***(n.)***.

**spool** (spōōl), *n.* (١) بەکرە (ی دەزوو یا شریتی سینەما... هتد)؛ چەرخ؛ خولخولۆکە. (٢) پڕ بەکرەیەك (٣) شتێکی لە بەکرە چوو.

*v.t.* هەڵکردنە سەر بەکرە.

**spoon** (spōōn), *n.* (١) کەوچك. (٢) شتێکە لە کەوچك بچێ بەتایبەتی:
(ا) دانەخۆرەی کانزایی ڕاوەماسی. (پێشی دەووترێ: " **spoon bait** ").
(ب) سەوڵی دەم قوپاو. (٣) گوڕزی دەم کەوچکی یاری گۆڵف.
*v.t.* (١) بە کەوچك تێکردن؛ هەڵهێنجان (بە کەوچك).
(٢) لە تۆپ دان هەر وەك خواردەمەنی هەڵهێنجان بە کەوچك، واتە بۆ سەرەوە (یاری گۆڵف). (٣) ناو هەڵکەندن؛ وەك کەوچك لێکردن.
*v.i.* (١) ڕاوەماسی کردن بە دانەخۆرەی لە کەوچك چوو.
(٢) لە تۆپ دان هەر وەك خواردەمەنی هەڵهێنجان، واتە بۆ سەرەوە (یاری گۆڵف). (٣) [Colloq.]، ماچ‌ومووچ کردن؛ دەستبازی کردن.
**born with a silver spoon in one's mouth,** لە خێزانێکی دەوڵەمەندا لەدایکبوون؛ بە خواپێداوی هاتنە دنیاوە؛ بە دەوڵەمەندی لەدایکبوون.

**spoon-bill** (spōōn′bil′), *n.* (١) کەوچکە دەنووکی. باڵندەیەکی گەورەی قەراغ ئاوە سەری دەنووکی پانە لە کەوچك دەچێ.
(٢) مراوییەکی دەنووك خاکەنازییە. (هەروەها " **shoveler** ").
(٣) **puddlefish** . (٤) دەنووکی کەوچکی.

**spoon bread,** نانەکەوچکی. جۆرە نانێکی گەنمەشامییە لە هەویر دەچێ دەبێ بە کەوچك تێ کرێ.

**spoon-drift** (spōōn′drift′), *n.* = spindrift.

**spoonerism** (spōōn′ēr-iz'm), *n.* جێگۆڕکێ پێکردنی تیپ‌و دەنگی سەرەتای دوو ووشە لە قسەکردندا (وەك:
" **Let me sew you to your sheet.** " لە باتی:
" **Let me show you to your seat.** " یان " **sons of toil** " لەباتی:
" **tons of soil** ").

**spooney** (spōōn′i), *n.* = spoony.

**spoonfed** (spōōn′fed′), *adj.* (١) بە کەوچك نان کراو بە دەمەوە.
(٢) (ا) نازدار؛ نازکێشراو؛ شت زۆر بۆ ئاسان کراو.
(ب) ڕێ پێ نەدراو بۆ ئیش کردنی خۆ بە خۆ.

**spoonfeed** (spōōn′fēd′), *v.t.* (١) نان کردن بە دەمەوە بە کەوچك.
(٢) (ا) بە نازداری بەخێوکردن؛ نازکێشان.
(ب) شت زۆر بۆ ئاسان کردن؛ هەموو شت بۆ کردن.

**spoonful** (spōōn′fool′), *n.* پڕ کەوچکێك؛ کەوچکێك.

**spoony, spooney** (spōōn′i), *n.* (١) دڵدارێکی هۆش لای خۆ نەماو؛ دڵدارێکی ڕەووشت منداڵانە. (٢) کەسێکی زۆر بەسۆزو شێتۆکە.
*adj.* (١) بۆ شێت بوو (دڵدار)؛ شێت‌وشەیدا.
(٢) بەسۆزو شێتۆکە؛ مێشك سووك.

**spoor** (spoor, spôr, spōr), *n.* شوێن پێی گیانەوەری کێوی ڕاوکراو.
*v.t. & v.i.* شوێن پێ هەڵگرتن.

**sporadic** (spô-rad′ik, spō-rad′ik), *adj.* تاك‌وتەرا؛ جار جار؛ تاك‌وتووك؛ ناوبەناو؛ پچڕپچڕ؛ کەم کەم.
-sporadically *(adv.)*; sporadicalness *(n.)*.

**sporangium** (spô-ran′ji-əm), *n.* توورەکەی تۆوی قەوزەو کەڕوو (هەروەها " **spore case** ").

**spore** (spôr, spōr), *n.* سپۆر. تەنێکی یەك خانەییە دەبێت بە زیندەوەر وەك لە میکرۆبی لەرزوتاو قەوزەو کەڕوودا؛ تۆو.
*v.i.* گرتن‌و هێنانەبەری ئەم تۆوە یا تەنە یەك خانەییە.

**spore case,** = sporangium.

**sporocyst** (spôr′ə-sist′, spōr′ə-sist′), *n.* توورەکەی تۆو

(زیندەوەرزانی)

**sporogenesis** (spôr′ə-jen′ə-sis, spō′rə-jen′ə-sis), *n.* (١) زۆربوون لە ڕێی بوونی تەنی یەك شانەیی بە زیندەوەر.
(٢) درووستبوونی تۆو یا تەنی یەك خانەیی وەك لە هەندێ میکرۆب‌و قەوزەو کەڕوودا

**sporophore** (spôr′ə-fôr′, spō′rə-fôr′), *n.* ئەندامی تۆوهەڵگری هەندێ میکرۆب‌و قەوزەو کەڕوو.

**sporophyte** (spôr′ə-fīt′, spō′rə-fīt′), *n.* نەوە یا بەرەی تۆوگری هەندێ میکرۆب‌و قەوزەو کەڕوو.

**sporozoan** (spôr′ə-zō′ən, spō′rə-zō′ən), *n.* زیندەوەرێکی یەك خانەیی لاکوتە (وەك میکرۆبی لەرزوتاو تای تەکساسی کە تووشی ڕەشەووڵاخ دەبێ).
*adj.* تایبەتی بەم جۆرە زیندەوەرە.

**sporran** (spor′ən, spôr′ən), *n.* جزدانی ئوسکوتلەندی؛ جزدانێکی فەروەیە لەبەردەمی پشتێنەوە شۆڕدەبێتەوە.

**sport** (spôrt, spōrt), *n.* (١) یاری؛ ڕابواردن؛ خۆشی؛ شتێکی خۆشە کاتی پێوە ڕابوێرێ. (٢) وەرزش.
(٣) (ا) گاڵتەچی؛ گاڵتەپێکراو. (ب) شتی یاری پێکراو.
(٤) [Colloq.]، قومارچی؛ قومارکەر.
(٥) [Colloq.]، کەسێکی خۆبادەرو دەستبڵاو؛ کەسێکی خۆدەرخەر یا خۆنوێنەر. (٦) [Obs.]، دەستبازی؛ دڵداری؛ چاوباشقاڵی.
(٧) گیاندارێك یا ڕووەکێکی جیاواز لە توخمەکەی.
*v.t.* [Colloq.]، لە ئەندازە بەدەر دەرخستن یا نوواندن؛ زۆر خۆبادان:
*(He is ~ing a loud suit.)*
*v.i.* (١) یاری کردن؛ ڕابواردن؛ کات بردنەسەر بە خۆشی‌و ڕابواردن.
(٢) وەرزش کردن؛ یاری کردن. (٣) (ا) گاڵتەکردن؛ گاڵتەوگەپ کردن.
(ب) گاڵتەپێکردن؛ گاڵتە پێ هاتن؛ بە سووك یا گاڵتە دانەبەر.
(٤) [Archaic]، دەستبازی کردن؛ چاوباشقاڵی کردن؛ دڵداری کردن
(٥) جیابوون لە توخمی خۆ (گیانەوەرناسی، ڕووەکناسی).
*adj.* (١) هی وەرزش؛ بۆ وەرزش شیاو.
(٢) سەرپێیی (جل‌وبەرگ)؛ سپۆرت؛ خاکی: *(a ~ shirt, jacket, etc.)*
**in (or for) sport,** بە گاڵتەوە؛ هەر بۆ گاڵتە.
**make sport of,** گاڵتەپێکردن؛ پێ پێکەنین.

**sportful** (spôrt′fəl, spōrt′fəl), *adj.* (١) خۆش؛ سەیر.
(٢) حەز لە یاری کەر؛ یاری باز. (٣) هەر بۆ خۆشی‌و یاری‌و گاڵتە کراو
-sportfully *(adv.)*; sportfulness *(n.)*.

**sporting** (spôr′tiŋ, spōr′tiŋ), *adj.* (١) وەرزشی؛ هی یاری.
(٢) وەرزشکار؛ حەزکەر لە وەرزش؛ یاریکەر. (٣) بە ویژدان.
(٤) قوماری؛ هی گرەوکردن لەسەر غارغارێنی ئەسپ‌و یاری ... هتد.

**sporting house,** [Colloq.], (١) قومارخانە. (٢) قەحبەخانە.

**sportive** (spôr′tiv, spōr′tiv), *adj.* (١) حەز لە یاری کەر.
(٢) وەرزشی؛ حەز لە وەرزش کەر. (٣) گاڵتە؛ بە گاڵتەوە.
(٤) [Obs.]، بەرەڵا؛ حەز لە دەستبازی‌و چاوباشقاڵی کەر.
-sportively *(adv.)*; sportiveness *(n.)*.

**sports** (spôrts, spōrts), *adj.* هی وەرزش؛ بۆ وەرزش شیاو؛ سەرپێیی (جل‌وبەرگ)؛ خاکی؛ سپۆرت: *(~ clothes)*.

**sports car; sport car,** ئوتومبیلی سپۆرت: ئوتومبیلی بچووکی دوو کەسی سەرکراوەی نزم‌و خێرا.

**sportsman** (spôrts′mən, spōrts′mən), *n.* (١) وەرزشکار (بەتایبەتی ڕاوچی‌و ڕاوەماسیکەر)؛ وەرزشیار.
(٢) کەسێکی بەویژدان‌و بەنەزاکەتە کە شت بە ئاسانی دەگرێ‌و بە بەشی خۆی قایلە بەبێ بۆڵەبۆڵ کردن؛ کەسێکی سپۆرت.
-sportsmanly *(adj.)*.

**sportsmanlike** (spôrts′mən-līk′, spōrts′mən-līk′), *adj.* لە ڕەووشتی جوانی وەرزشکار دەچێت؛ لە ڕەفتاری ڕێك‌وپێکی وەرزشیار دەکات.

**sportsmanship** (spôrts′mən-ship′, spōrts′mən-ship′), *n.* (١) وەرزشکاری؛ وەرزشیاری؛ حەز لە وەرزش کردن.
(٢) ڕەفتاری جوان‌و بەویژدان‌و نەزاکەت‌و قایل بوون بە بەشی خۆ بەبێ بۆڵەبۆڵ کردن؛ ڕەفتاری وەرزشیاری؛ ڕەووشتی جوان.

**sportswear** (spôrts'wâr, spōrts'wâr'), ***n.*** جلوبەرگی وەرزش.

**sportswoman** (spôrts'woom'ən, spōrts'woom'ən), ***n.***
وەرزشکاری ژن؛ وەرزشیاری ژن

**sporty** (spôr'ti, spōr'ti), ***adj.*** (١) وەرزشی؛ بۆ وەرزش شیاو.
(٢) سەرپێیی (جلوبەرگ)؛ وەرزشی؛ خاکی.
(٣) بەرەڵا؛ سەرسەری؛ بێ ئابروو.
(٤) زەق (جلوبەرگ)؛ بۆ خۆنواندن لەبەرکراو.

**-sportily** ***(adv.)***; **sportiness** ***(n.)***.

**sporulate** (spôr'yoo-lāt'), ***v.i.*** کەرت کەرت بوونی شانەو بوونی هەر کەرتێك بە زیندەوەرێکی تازە.

**sporulation** (spôr'yoo-lā'shən), ***n.*** زیادبوون یا زاوزێ کردن لە ڕێی کەرت بوونی شانەوەو بوونی هەر کەرتێك بە زیندەوەرێکی تازە.

**spot** (spot), ***n.*** (١) خاڵ؛ پەڵە؛ نیشانە:
***( a blue tie with red ~s )***
(٢) پەڵە؛ لەکە؛ پیسی.
(٣) لەکە (ناوبانگ، ڕەوشت)؛ نەنگ: ***( the only ~ on her name )*** .
(٤) جێ؛ شوێن؛ جێگە؛ جێگا: ***( This is the very ~ where we met. )*** .
(٥) ماسی‌یەکی دەریایی‌یە خاڵێکی ڕەش بە پشت شانی‌یەوەیەتی.
(٦) [British Colloq.]، ئەخت؛ تۆز.
(٧) [Slang]. **spotlight** .
(٨) [Slang]، پلەوپایە؛ شوێن:
***( He has a good ~ with that company. )***
(٩) [Slang]، کاتی نیش کردن یا دەرکەوتنی کەسێك لە بەرنامەیەکدا.

***v.t.*** (١) خاڵ خاڵاوی کردن؛ نیشانەکردن بە خاڵی بچووك.
(٢) لەکەدارکردن؛ پیس کردن. (٣) نیشانەکردن بۆ دواوێژ.
(٤) دانان لە جێ‌یەکی تایبەتیدا.
(٥) لەکە لێکردنەوە؛ پەڵە لێ لابردن؛ پاکردنەوە.
(٦) [Colloq.]، بەدی کردن؛ بینین؛ ناسینەوە:
***( to ~ a mistake; I ~ted her in the crowd. )***

***v.i.*** (١) پیس بوون؛ پەڵە گرتن. (٢) لەکاوی کردن؛ پیس کردن.

***adj.*** (١) (ا) ئامادە (بۆ دان): ***( ~ cash )*** .
(ب) یەکسەر بە پارەی ڕەق دراو. (ج) تەنها بە پارەی ڕەق سەوداکراو.
(٢) هەرچۆنێك گونجا وەها کراو؛ هەر بۆ نموونە کراو؛ بە بێ ئاگاداری کردن:
***( to make ~ checks of their records )***
(٣) (ا) لە ئێستگەیەکی ڕادیۆی ناوخۆوە بڵاوکراوە
(ب) خراوەتە نێوان بەرنامە ڕادیۆیی‌یەکانەوە (بڵاوکراوەی بازرگانی).

**hit the high spots,** [Colloq.], تەنها خاڵە گرنگەکان باس کردن.

**hit the spot,** [Colloq.], جێی خۆ گرتن؛ لەکات و شوێنی خۆیدا بوون؛ پێکان: ***( The hot meal I had at your house hit the spot. )*** .

**in a spot,** [Slang], لە گیروگرفتدا؛ لە تەنگوچەڵەمەدا؛ لە باری خراپدا.

**on the spot,** (١) لە جێگەی ناوبراودا.
(٢) یەکسەر؛ دەمودەست؛ بەبێ دواکەوتن.
(٣) [Slang]، لە تەنگوچەڵەمەدا؛ لە کێشەی خراپدا.
(٤) تەنگەتاو؛ بەگیرهێنان؛ تەریق کردنەوە (بەتایبەتی بە پرسیار یا داوای ئابەجێ لەکاتی نابەجێدا): ***( She put him on the spot. )*** .
(٥) لە مەترسی کوشتندا.

**touch a (or one's) sore sport,** [Colloq.], دەمارگرتن؛ برین کولاندنەوە.

**spotless** (spot'lis), ***adj.*** (١) خاوێن؛ پاك.
***( a ~ room, house, plate, etc. )***
(٢) پاك (ناوبانگ)؛ بێ لەکە؛ بێ نەنگ: ***( a ~ reputation, name, etc. )*** .

**spotlight** (spot'līt'), ***n.*** (١) ڕووناکی زۆر بەتینی سەر شانۆ؛ ڕووناکی‌یەکی بە شەوق. (٢) گڵۆپ یا چرای شەوق هاوێژ؛ شەوق هاوێژ.
(٣) زۆر دەرکەوتوویی؛ زۆر لە بەرچاوی خەڵکدا بوون؛ پلەو پایەیەك یا شوێنێکی سەرنج ڕاکێش:
***( He was in the political ~ for a long time. )***

***v.t.*** (١) ڕووناك کردنەوە؛ شەوق خستنەسەر؛ باش دەرخستن.
(٢) سەرنج بۆ ڕاکێشان: ***( to ~ an event, item, etc. )*** .

**spotted** (spot'id), ***adj.*** (١) بەڵەك؛ خاڵدار؛ کونج؛ کونج کونج؛ خاڵاوی؛ پەڵەپەڵاوی. (٢) لەکەدار؛ لەکاوی؛ پیس.

**spotted adder,** = **milk snake.**

**spotted fever,** پەڵە تا: پەتایەکە تاو سەرئێشەو پەڵەی سووری سەر پێستی لەگەڵدایە (وەك ڕەشەگرانەتا).

**spotter** (spot'ẽr), ***n.*** (١) نیشانەکەر (بۆ ناسینەوە)؛ دیاریکەر.
(٢) سووسە بەتایبەتی: (ا) دیاریکەری سەنگەری دوژمن.
(ب) گوێ قوڵاخی فڕۆکەی هاتوو: ***( Aircraft ~ )*** .
(٣) چاودێر یا سووسەی کار ناپاکی (وەك دزی) فەرمانبەرانی دەسگایەك (بەتایبەتی بانق). (٤) کارگەی پەڵە لابەر (ئوتوخانە).
(٥) شت دانەر لە جێی خۆیدا یا باشدا.

**spot test,** (١) تاقیکردنەوەی دەمودەست بۆ ئەنجامی دەمودەست.
(٢) تاقیکردنەوەی چەند نموونەیەك هەرچۆنێك گونجا بەبێ خۆ بۆ ئامادەکردن

**spotty** (spot'i), ***adj.*** (١) بەڵەك؛ کونج؛ پنك پنك؛ پەڵە پەڵاوی:
***( a ~ skin )***
(٢) پچڕپچڕ؛ ناڕێك‌وپێك: ***( his ~ class attendance )*** .
(٣) باشی‌یەکەی جیاوازە لە بەشێکەوە بۆ بەشێکی تر؛ ناڕێك‌وپێك؛ هەمووی وەك یەك باش نی‌یە: ***( a ~ piece of work )*** .

**-spottily** ***(adv.)***; **spottiness** ***(n.)***.

**spousal** (spou'z'l), ***n.*** (١) ژن و مێردایەتی؛ هاوسەری.
(٢) ***(pl.)***، شایی.

***adj.*** هی شایی؛ هی مارەیی.

**spouse** (spouz, spous), ***n.*** هاوژین؛ هاوسەر؛ ژن؛ مێرد.

***v.t.*** [Archaic], (١) ژنهێنان؛ هێنان؛ شووپێکردن. (٢) مارەکردن؛ دان بە شوو.

**spout** (spout), ***n.*** (١) لوولە (قۆری، مەسینە، لوولێنە). (٢) فیچقە.
(٣) پلووسك. (٤) پەیژەیەکی کارەبایی بچووکە بارمتەکەر زۆر بەکاری دەهێنا بۆ بردنە سەرەوەی شتی بارمتەکراو بۆ عەمارکردنی.
(٥) [Slang]، بارمتەخانە؛ دووکانی بارمتەگر.

***v.t.*** (١) فیچقەپێکردن: ***( A whale ~ed water high in the air. )*** .
(٢) بە دەنگی بەرزو لەخۆ بایی‌یانەوە ووتن؛ لاف لێدان و ئەبڕینەوە.
(٣) [Slang]، بارمتەکردن.

***v.i.*** (١) فیچقەکردن. (٢) بە خوڕ لەبەر ڕۆیشتن.
(٣) قسەکردن و ئەبڕینەوە بە کەش‌وفشێکەوە؛ دەم ئەوەستان وەك جیکەنە؛ زۆرووێژی کردن لە شێوەی ووتار خوێندنەوەدا.

**up the spout,** [Slang], (١) لە بارمتەدایە؛ بارمتەکراوە.
(٢) ماڵ وێران؛ دەسکورت؛ بێ پارە؛ فەوتاو؛ پەرێشانە بۆ پارە.

**spraddle** (sprad''l), ***v.t. & v.i.*** [Dial. or Colloq.], لاق بڵاو- کردنەوە (بۆ سواربوون یا قاچ هەڵهێنانەوە بەسەر شتێکدا).

**sprag** (sprag), ***n.*** (١) کۆڵەکەی سەربانی کانگەی خەڵووز.
(٢) پارچەیەك دار، بەرد، یا ئاسنە دەخرێتە بەر پێچکەی ئوتومبیلەوە بۆ خل نەبوونەوەی.

**sprain** (sprān), ***v.t.*** لە خرتکە بردن؛ پێ لە خرکە چوون؛ لە جێ بردن؛ ترازان.

***n.*** لە خرتکە چوون؛ لە خرکە چوون؛ لە جێ چوون؛ ترازان.

**sprang** (spraŋ), *alternative past tense of* **spring.**

**sprat** (sprat), ***n.*** (١) جۆرە ماسی‌یەکی بچووکی ئەورووپایی‌یە لە توخمی " هێرینگ " . (٢) کەسێکی بچووك یا هیچ‌وپووچ.

**sprawl** (sprôl), ***v.i.*** (١) لەپەرپووو کەوتن؛ پاڵ کەوتن یا دانیشتن و دەست و پەل لێ ڕاکێشان؛ خۆ لێ ڕاکێشان. (٢) بە زەویدا کشان یا بە گاگۆڵکێ ڕۆیشتن بە ناشرینی و ناقۆڵایی. (٣) بە هەموولایەکدا بڵاوبوونەوە بە ناڕێك‌و- پێکی (شار، دەسخەت)؛ تەرز فرێدان (مەجان).

**v.t.** ڕاکشاندن و دەست‌وپەل بڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە یا پەرە پێسەندن بە ناڕێک‌وپێکی.

**n.** (١) لەپەڕوبوو ڕاکشان؛ ڕاکشان و دەست‌وپەل بڵاوکردنەوە.
(٢) بڵاوبوونەوە یا گەورەبوون بە ناڕێک‌وپێکی (شار)؛ پەرەسەندن بە لامسەرلایی: ( *urban ~* ).

-**sprawler** *(n.)*; **sprawly** *(adj.)*.

**sprawling** (sprôl′iŋ), *adj.* بڵاو (شار) بە هەموولایەکدا کشاو، پەرەسەندوو، یا بڵاوبووەوە؛ زۆر گەورە: *( a ~ city)* .

**spray** (sprā), *n.* (١) ئاورشێن؛ ئاوپرژێن؛ ئاوپرژێن؛ پرژ؛ پرش.
(٢) شلەی پرژێنراو (گوڵاو، دەرمانی جانەوەر کوشتن، شلەی شت پاککردنەوە).
(٣) تورومپای شلەو دەرمان پرژێنەر؛ پرژێنەر.
(٤) شتێکە لە ئاوپرژێن بکات: *( a ~ of gunfire)* .

**v.t.** (١) ئاورشێن کردن؛ ئاوپرژێن کردن.
(٢) لێ هەڵپرژان؛ لێ پرژان؛ بە تورومپای هەڵپرژێن لێدان یا پێوەکردن:
*( He ~ed paint on the wall.)*

**v.i.** هەڵپرژان؛ هەڵپژان.

**spray** (sprā), *n.* (١) خەڵف (بەتایبەتی بە گوڵ و خونچەوە) لقی بچکۆلەی گەڵادار. (٢) گوڵبەندێکە لە شێوەی ئەم خەڵفەدا (بۆ سەر تەرم و شتی وا). (٣) شتی ڕازێنەرەوە لە شێوەی ئەم خەڵفەدا (یەخەبەند، خشڵ).

**sprayer** (sprā′ēr), *n.* مەکینەی هەڵپرژێن (بۆیە، دەرمان)؛ تورومپای پرژێنەر.

**spray gun,** تورومپای پرژێنەر

**spread** (spred), *v.t.* (١) کردنەوە؛ یەکالاکردنەوە؛ ڕاخستن.
(٢) خستنەڕوو؛ پیشاندان؛ دەرخستن؛ نواندن.
(٣) داچەقاندن؛ ڕاکێشان: *( to ~ one's legs)* .
(٤) بڵاوکردنەوە؛ پەخشکردن؛ پرش و بڵاوکردنەوە.
(٥) تێهەڵسوون؛ لێدان؛ بەسەردا بڵاوکردنەوە:
*( She ~ butter on the toast.)*
(٦) درێژەپێدان؛ دابەشکردن بەسەر کاتێکی درێژدا:
*( The bank ~ the payments on the loan over two years.)*
(٧) بڵاوکردنەوە (دەنگوباس، نەخۆشی، قاو)؛ تەشەنەپێدان:
*( Radio ~s news quickly.; She loves to ~ rumors.; Unsanitary conditions ~ disease.)*
(٨) داپۆشین (٩) سفرە ئامادەکردن؛ مێزی خواردن ڕازاندنەوە.
(١٠) لەیەک دوورخستنەوە؛ لەیەک جیاکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ بڵاوەپێکردن.
(١١) سەر پانکردنەوە (بزمار)

**v.i.** (١) کرانەوە؛ کشان؛ فراوان بوون؛ داچەقان.
(٢) پرش و بڵاوبوونەوە؛ بڵاوبوونەوە؛ دابەشبوون.
(٣) بڵاوبوونەوە (دەنگوباس، قاو)؛ دەنگدانەوە؛ تەشەنەکردن:
*( The news ~ quickly.)*
(٤) لەیەک دوورکەوتنەوە؛ بڵاوەلێکردن؛ بڵاوبوونەوە.
(٥) تێهەڵسوونی ئاسانە؛ بە ئاسانی بە سەریدا بڵاودەکرێتەوە.

**n.** (١) کرانەوە؛ کشان؛ پرش و بڵاوبوونەوە؛ بڵاوبوونەوە؛ پەخشان؛ تەشەنە.
(٢) ڕادەی کرانەوە یا بڵاوبوونەوە؛ ڕادەی بڵاوکرانەوە.
(٣) پانایی؛ شوێنێکی بەر بەرەڵا و فراوان
(٤) (ا) دوو لاپەڕەی ئەمبەر و ئەوبەری ڕۆژنامە یا گۆڤار.
(ب) نووسراوێک کە چەند خانەیەک یا لاپەڕەیەک لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر بگرێتەوە (٥) سەرمێز؛ سەرجێ. (٦) شتی لە نان تێهەڵسوون (کەرە، مرەبا).
(٧) [Colloq.]، خوانی ڕازاوە بە خواردنی هەمەچەشنە؛ جەژن.
(٨) [Colloq.]، خۆنواندن؛ کەش‌وفش؛ خۆدەرخستن.
(٩) درێژی باڵی فڕۆکە (١٠) پێڕ (قومار، یاری).

**spread oneself thin,** خەریکی کردنی گەلێک شت بوون لە هەمان کاتدا (بە شێوەیەک کە ئەو کەسە نەتوانێ هیچیان بە باشی بکات و خۆیشی زۆر ماندوو بکات).

**spread eagle,** (١) وێنەی سیسارکی باڵ و لاق کراوە (کە درووشمی ئەمەریکایە). (٢) وێنەیەکی وەها لە یاری سەهۆڵ خلیسکێدا.

**spread-eagle** (spred′ē′g'l), *adj.* (١) لە وێنەی سیسارکی باڵ و لاق کراوە دەکات. (٢) [Colloq.]، لاف لێدەری جەنگاوەر (بەتایبەتی لە نیشتمان پەروەریدا)؛ خۆهەڵکێش.

**v.t.** پەل پێ بڵاوکردنەوە (بۆ سزا یا بۆ فەلاقەکردن).

**v.i.** لاف لێدان (بەتایبەتی لە نیشتمان پەروەریدا)؛ گەزاف لێدان؛ خۆهەڵکێشان.

**spreader** (spred′ēr), *n.* (١) چەقۆی کەرەو مرەبا لە نان هەڵسوون.
(٢) مەکینەی تۆودان؛ مەکینەی پەین بڵاوکردنەوە بە زەویدا.
(٣) شیشی لە دووری یەکترییەوە ڕاگرتنی دوو هێڵ یا تەل بە کرژی.

**spree** (sprē), *n.* (١) ئاهەنگ و زەماوەند؛ بەلەسەیی؛ کەیف و یاری و هەراهەرا. (٢) خواردنەوەیەکی زۆر؛ سەرخۆشی؛ مەستی.
(٣) بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن: *( She went on a buying ~ .)* .

**sprig** (sprig), *n.* (١) خەڵف؛ چڵ؛ چووز؛ لقی بچووک.
(٢) نەخشی سەر کاڵا لە شێوەی خەڵفێکی گەڵاو گوڵداردا.
(٣) بزماری بچووکی بێ سەر (٤) هەرزە.
(٥) وەجاخ؛ نەوە؛ وەچە؛ بەرە (لەڕووی گاڵتەوە).

**v.t.** (١) خەڵف لێکردنەوە؛ لق لێکردنەوە.
(٢) ڕازاندنەوە بە نەخشەی خەڵفی گوڵ و خونچەدار.
(٣) بە بزماری بچووکی بێ سەر قایم کردن یا لەیەکدان.

-**spriggy** *(adj.)*.

**spright** (sprīt), *n.* = sprite.

**sprightly** (sprīt′li), *adj.* چوست‌وچالاک؛ گورج؛ زیندوو؛ زیت؛ دڵخۆش؛ بەجۆش.

**adv.** بە خۆشی و گورج‌وگۆڵی؛ بە چوست‌وچالاکی؛ بەجۆشەوە.

-**sprightliness** *(n.)*.

**spring** (spriŋ), *v.i.* (١) (ا) هەڵبەزینەوە؛ هەڵبەزانەوە؛ بازدان؛ قونەکردن؛ قەڵەمبازدان. (ب) لە پڕ هەڵسانە سەر پێ؛ لە پڕ بەرزبوونەوە.
*( He sprang to his feet.)*
(ج) گەڕانەوە بۆ قەبارەی پێشووی خۆ پاش گوشین یا پەستانەوە
(د) هاتن بەسەر زماندا؛ هاتن بە دەمدا.
(٢) (ا) پشکوتن؛ تەقین (تۆوی ڕوواو)؛ لێوە دەرهاتن:
*( The plant ~s from a seed.)*
(ب) لەوەوە هاتن؛ لەوەوە پەیدابوون:
*( This error ~s from faulty reasoning.)*
(ج) لە پڕ پەیدابوون؛ قوت بوونەوە؛ لە پڕ هاتنەڕوو:
*( Cities and towns ~ up.)*
(د) لە بنەچەیەکی تایبەتییەوە هاتن:
*( He ~s from a famous stock.)*
(هـ) [Archaic]، دەرکەوتن (ڕۆژ، بەرەبەیان)؛ ڕۆژبوونەوە.
(٣) تەقینەوە (مین)؛ تەقین.
(٤) قوپان؛ درز تێ بوون؛ شەق بردن؛ خواربوون؛ نوشتانەوە.
(٥) لە هەمووشتێکی دەورووپشت بەرزتربوون:
*( The church steeple ~s high above the town.)*

**v.t.** (١) هەڵساندن (لە شوێنی نیشتندا):
*( We sprang a covey of quail.)*
(٢) باز بەسەردادان: *( He sprang the wall.)* .
(٣) داخستن (بە باز بە سەردادان): *( The fox sprang the trap.)*
(٤) نوشتاندنەوە؛ خوارکردن؛ درزتێکردن؛ شکاندن؛ قوپاندن.
(٥) تەقاندنەوە (مین)؛ تەقاندن.
(٦) لەپڕ بڵاوکردنەوە؛ لە پڕ ووتن؛ لە دەم دەرپەڕان:
*( When will you ~ the news of your marriage? )*
(٧) [Slang]، لە بەندیخانە بەرەڵاکردن بە دەستەبەری کردن.

**n.** (١) (ا) باز؛ قەڵەمباز؛ بازدان؛ ماوەی باز.
(ب) هەڵبەزینەوە؛ گەڕانەوەی سپرینگ بۆ باری پێشووی خۆی پاش گوشین یا پەستانەوە (ج) توانای ئەم گەڕانەوەیە؛ لاستیکێتی؛ جیری.

(٢) زەمبەلەك؛ سپرینگ. (٣) كانی؛ كانیاو؛ كاریز؛ سەرچاوە.
(٤) سەرچاوە؛ بنچینە. (٥) بەهار.
(٦) سەرەتا؛ بەهار (مەجاز): ***( He was in the ~ of his life.)*** .
(٧) قوپاوی؛ خواری؛ شكاوی؛ درز؛ لاری.
(٨) [Archaic]، بەرەبەیان؛ ڕۆژبوونەوە.
(٩) [Scot]، گۆرانی‌یەكی خۆش؛ سەمایەكی بەجۆش.
(١٠) پایەی ژێر تاق (كە تاقەكە لێوەی بەرز دەبێتەوە).

***adj.*** (١) بەهاری: لە بەهاردا نێژراو یا چێنراو؛ بۆ بەهار.
(٢) جیڕ: لاستیكی؛ وەك سپرینگ وایە لە هەڵبەزینەوەو گەڕانەوە بۆ باری پێشووی پاش گووشین یا پەستانەوە؛ زەمبەلەكی.
(٣) سپرینگدار؛ هی سپرینگ؛ بە سپرینگ كراو: ***( a ~ mattress)*** .
(٤) هی كانیاو؛ هی كانی؛ لە كاریزەوە هاتوو: ***( ~ water )***

**springal** (spriŋʹəl), ***n.*** [Archaic]. لاو؛ هەرزە؛ كوڕ؛ پیاوی گەنج

**springald** (spriŋʹəld), ***n.*** [Archaic], = **springal.**

**spring beauty,** چەند جۆرێكە لە گوڵە بەهارە.

**spring-board** (spriŋʹbôrdˊ, spriŋʹbōrdˊ), ***n.*** (١) تەختەی بازد (تەنافبازی). (٢) **diving board** .
(٣) جێی گوڕگرتنەوەو دەرپەڕین؛ جێی دەستپێكردن؛ سەرەتای كار.

**springbok** (spriŋʹbokˊ), ***n.*** ئاسكێكی ئەفەریقایی‌یە قەڵەمبازدی بەرز دەدات

**springbuck** (spriŋʹbukˊ), ***n.*** = **springbok.**

**spring chicken,** (١) باڕۆكە
(٢) [Slang]، باڕۆكە؛ لاوێكی ساوێلكە؛ كچێكی گەنج‌و نەشارەزا؛ هەرزە:
***( At her age, she's no ~ .)***

**spring-cleaning** (spriŋʹklēnˊiŋ), ***n.*** پاككردنەوەیەكی زۆرباش؛ پاككردنەوەیەكی تەواو.

**springe** (sprinj), ***n.*** تەڵە؛ داو

***v.t.*** كردن بە تەڵەوە؛ كردن بە داوەوە.

***v.i.*** تەڵە بۆ نانەوە؛ داو بۆ نانەوە.

**springer** (spriŋʹẽr), ***n.*** (١) بازدەر؛ قەڵەمبازدەر.
(٢) **springer spaniel** (٣) **springbok**
(٤) **grampus** . (٥) **spring chicken** .
(٦) (أ) پایەی ژێر تاق (كە تاقەكە لێوەی بەرز دەبێتەوە). (ب) بنچینەی تاق.

**springer spaniel,** قەڵەمبازدەر سەگێكی ڕاوی قەڵەمبازدەری گوێ شۆڕی تووك نەرمە.

**spring fever,** تا بەهارە: هەستی سستی‌و تەمەڵی یا بێ ئارامی سەرەتای بەهار.

**springhalt** (spriŋʹhôltˊ), ***n.*** = **stringhalt.**

**spring-house** (spriŋʹhousˊ), ***n.*** خانوچكەی سەر جۆگەلە (بۆ خواردەمەنی بە ساردی ڕاگرتن وەك " یەخچاڵ ").

**springlet** (spriŋʹlit), ***n.*** كانی‌یەكی بچكۆلە.

**spring lock,** قفڵی سپرینگدار.

**spring-tail** (spriŋʹtālˊ), ***n.*** كلك زەمبەلەكی: جانەوەرێكی بێ باڵە دوو كلكی زەمبەلەكی هەیە بۆ قونەكردن.

**spring-tide** (spriŋʹtīdˊ), ***n.*** = **spring-time.**

**spring-tide,** (١) بەرزاوی بەرز (لە سەرەتاو لە ناوەڕاستی مانگدا ڕوودەدات). (٢) لێشاو (هەست)؛ لافاو (مەجاز)

**spring-time** (spriŋʹtīmˊ), ***n.*** (١) بەهاران؛ دەمی بەهار. (هەروەها " **spring-tide** "). (٢) دەمەدەمی شت؛ سەرەتا؛ بەهار (مەجاز).

**springy** (spriŋʹi), ***adj.*** (١) لاستیكی؛ جیڕ؛ لە سپرینگ دەچێ؛ هەڵبەز
(٢) كانیاوی زۆرە؛ پڕە لە كانی.

-**springily** ***(adv.)***; **springiness** ***(n.).***

**sprinkle** (spriŋʹk'l), ***v.t.*** (١) ئاوڕشێن كردن؛ ئاوپرژێن كردن؛ پرژاندن؛ پرش‌و بڵاوكردنەوە. (٢) لێ هەڵپرژاندن؛ پێوەكردن (بەهارات، خوێ هتد) ***( He ~ some salt on his salad.)***

***v.i.*** (١) پرژان؛ هەڵپرژان.
(٢) بارین (نەرمە بارانی ئاوتاو): ***( It ~ all day on-and-off.)*** .

***n.*** (١) ئاوپرژێن؛ ئاوڕشێن؛ پرژان؛ پرژ.
(٢) نەرمە باران؛ نمەنمی باران؛ پرژە باران.

**sprinkler** (spriŋʹklẽr), ***n.*** (١) پرژێن؛ ئامێری پرژاندن؛ ئاوپرژێن.
(٢) ئاوپرژێنی ئاگر (ووشەی داهاتوو ببینە).

**sprinkler system,** (١) ئاوپرژێنی ئاگر: چەند ئاوپرژێنێكی ئاگر كوژێنەرەوەیە لەناو خانوودا بە ئۆتۆماتیكی دەكەونە ئیش لەكاتی ئاگر بەربوونەوەدا. (٢) ئاوپرژێنی چیمەن: چەند ئاوپرژێنێكی پێكەوەبەستراون بۆ چیمەن ئاودان بە شێوەیەكی ئۆتۆماتیكی.

**sprinkling** (spriŋʹkliŋ), ***n.*** (١) نەختێك؛ تۆزێك؛ كەمێك.
(٢) پرژ. (٣) ژمارەیەكی كەمی پرش‌و بڵاوكراوە هەرچۆنێك بێت.
(٤) هەڵپرژان؛ پرژان.

**sprint** (sprint), ***v.i.*** بەوپەڕی خێرایی ڕاكردن بۆ ماوەیەكی كورت؛ زۆر بە گوڕ ڕاكردن.

***v.t.*** دووری بڕین بە ڕاكردنی زۆر خێرا.

***n.*** (١) ڕاكردنێكی زۆر خێرای كورت. (٢) پێشبڕكێ‌یەكی بە گوڕی كورت
(٣) ماوەیەكی كورتی چالاكی نواندن؛ گوڕ؛ هەڵپە.

-srinter ***(n.).***

**sprit** (sprit), ***n.*** دار بایەوان.

**sprite** (sprīt), ***n.*** (١) جنۆكە؛ دێوودرنج.
(٢) [Archaic]، خێو.

**sprocket** (sprokʹit), ***n.*** (١) دانی چەرخ (وەك هی پاسكیل)
(٢) **sprocket wheel** .

**sprout** (sprout), ***v.i.*** (١) چەكەرەكردن؛ سەوزبوون؛ پشكوتن؛ ڕووان.
(٢) پەرەسەندن؛ سەردەرهێنان؛ خێرا.

***v.t.*** (١) چەكەرەپێكردن؛ ڕرواندن. (٢) چەكەرە لێكردنەوە.

***n.*** (١) چەكەرە؛ چووزو. (٢) وەچە؛ چووزو؛ وەجاخ؛ نەوەی تازە.
(٣) **Brussels sprouts** .

**spruce** (sprōōs), ***n.*** (١) درەختێكی هەمیشە سەوزە لە توخمی كاژ.
(٢) دارو تەختەی ئەم درەختە ستەوبەری‌یە. (٣) ڕەنگی سەوزی ڕەش داگیرساو.

**spruce** (sprōōs), ***adj.*** شۆخ؛ تەڕپۆش؛ شۆخ‌و شەنگ؛ جوان پۆش؛ ڕێك‌وپێك.

***v.t.*** ( ~ **up** ), شۆخ كردن؛ تەڕپۆش كردن؛ جوان پۆشین.

***v.i.*** ( ~ **up** ), خۆ شۆخ كردن؛ خۆ جوان‌و ڕێك‌وپێك كردن؛ خۆ لە تەل دان:
***( They ~ up a bit before the dinner party.)***

-**sprucely** ***(adv.)***; **spruceness** ***(n.)***; **sprucey** ***(adj.).***

**sprue** (sprōō), ***n.*** نەخۆشی‌یەكی ناوچە گەرمەكانە نیشانەكانی شۆری‌و خوێن كەمی‌و قوڕگ ئێشەن.

**sprue** (sprōō), ***n.*** (١) كونی كانزای تواوە كردنەناو داڕێژگەوە.
(٢) كانزای لەكیس چوو لەم داڕشتنەدا.

**sprung** (spruŋ), *p.p. and alternative past tense of* **spring.**

**spry** (sprī), ***adj.*** گورج‌وگۆڵ؛ چوست‌وچالاك.

**spud** (spud), ***n.*** (١) بێڵەكان.
(٢) [Colloq.]، پەتاتە.

***v.t.*** (١) بە بێڵەكان هەڵكەندن؛ بژاركردن. (٢) بیرە نەوت هەڵكەندن

**spue** (spū), ***v.t. & v.i.*** = **spew.**

**spume** (spūm), ***n.*** كەفی پیس؛ كەف‌و پیسایی سەرئاوكەوتوو.

***v.t. & v.i.*** كەفی پیس كردن‌و سەرئاوكەوتن.

-**spumous; spumy** ***(adj.).***

**spumone, spumoni** (spə-mōʹni), ***n.*** دۆندرمەیەكی ئیتاڵی چین چینە.

**spun** (spun), *past tense and p.p. of* **spin.**

***adj.*** هۆنراوە؛ ڕێسراو.

**spunk** (spuŋk), ***n.*** (١) پووشوو؛ قاو.

(۲) [British Dial.]، پزیسك؛ پریشك؛ كلْپە؛ ترووسكە.
(۳) [Colloq.]، غیرەت؛ ئازایی؛ بە جەرگی.
*v.i.* (۱) كلْپەكردن؛ داگیرسان. (۲) غیرەت گرتن؛ ئاگرگرتن.
**spunky** (spuŋ′ki), *adj.* [Colloq.], ئازا؛ بەغیرەت؛ بەجەرگ.
**-spunkily** *(adv.)*; **spunkiness** *(n.)*.
**spun silk,** ڕێسی ئاوریشم.
**spun yarn,** چەند گوریسێكی تێكەوەئاڵێنراو (كەشتیەوانی).
**spur** (spũr), *n.* (۱) مامزە؛ ئاسنی پاژنەی سوار؛ چوقولی ئاوزەنگی.
(۲) هان؛ هاندان؛ بزوێن؛ نەقیزە.
(۳) (ا) چوقولی سەر باڵولاقی هەندێ پەلەوەر.
(ب) بزماری ژێر پێلاوی داركەر (بۆ هەڵگەڕان بەسەر داری بەرزدا).
(ج) چوقولە ئاسنێكە دەبەسترێ بە لاقی كەڵەشێری شەڕەوە (بۆ بریندارکردنی كەڵەشێرەكەی تر). (د) قەڵبەدار؛ لقە داری كورت‌وسەر تیژ؛ چوقولەدار (كە هێشتا هەر بە دارەكەوە بێت).
(٤) لووتكە؛ پەل (شاخ).
(٥) (ا) پاڵپشتی دەرپۆقیوی دیوار.
(ب) دارێكی كورتە وەك كۆڵەكە درابێتە بەر شتێك
(٦) spur track.
*v.t.* (۱) ئاوزەنگی لێدان.
(۲) هاندان؛ نەقیزە تێوەژەندن؛ پاڵ پێوەنان بۆ پێشەوە.
(۳) چوقولە ئاسن پێوەكردن یا لێدان.
(٤) بریندارکردن بە چوقولە ئاسن (شەڕە كەڵەشێر).
*v.i.* ئاوزەنگی لێدان؛ پەلەكردن؛ خێراكردن.
**on the spur of the moment,** لەپڕ؛ بەبێ بیرلێكردنەوە لە پێشەوە؛ هەر كە هات بە خەیاڵدا:
*( They decided to get married on the spur of the moment.)*
**win one's spurs,** ناو (بۆ خۆ) دەركردن؛ سەركەوتن بۆ یەكەم جارو خۆ چەسپاندن.
**spurge** (spũrj), *n.* ڕووەكێكی گەڵا گۆشتنە شیلەیەكی سپی تاڵی تێدایە.
**spur gear,** *Also* **spur wheel,** چەرخی ددان‌دار.
**spurious** (spyoor′i-əs), *adj.* (۱) زۆڵ.
(۲) ساختە؛ درۆزنە؛ درۆ؛ قەڵب.
(۳) بە ساختە خراوەتە سەری یا بۆی زیادكراوە (نووسراو، بەڵگەنامە).
(٤) درۆزنە؛ لە ڕووالەتدا لە یەك دەچن نەك لە سرووشتدا (ڕووەكناسی).
**-spuriously** *(adv.)*; **spuriousness** *(n.)*.
**spurn** (spũrn), *v.t.* (۱) شەق تێهەڵدان؛ لەقەلێدان (لەڕووی سووكی‌یەوە؛ فڕێدانە ئەولاوە. (۲) نەویستن بە قێزەوە؛ بە لالووتەوە نەویستن؛ لەقەلێدان (مەجاز)؛ پێ ڕازی نەبوون:
*( She ~ed him.; He ~ed their offer.)*
*v.i.* بە قێزەوە نەویستن؛ بە لالووتەوە پێ ڕازی نەبوون؛ قێز لێ هاتنەوە؛ لەقەلێدان (مەجاز).
*n.* (۱) لەقە؛ شەق. (۲) نەویستنێكی بە لالووتەوە؛ بە قێزەوە پێ ڕازی نەبوون.
**spurred** (spũrd), *adj.* ئاوزەنگی لەپێ؛ ئاوزەنگیدار.
**spurrer** (spũr′ẽr), *n.* ئاوزەنگی لێدەر؛ هاندەر؛ پاڵ پێوەنەر.
**spurrier** (spũr′i-ẽr), *n.* ئاوزەنگیچی
**spurry, spurrey** (spũr′i), *n.* ڕووەكێكی گوڵ سپی گەڵا دەزوولەیی‌یە.
**spurt** (spũrt), *v.t.* فیچقەكردن؛ پڕژان؛ بە خوڕولەپڕ لێوە هاتنەدەرەوە.
*v.i.* (۱) فیچقەكردن؛ بە خوڕو لەپڕ لێ هاتن؛ پرژان؛ هەڵقوڵان؛ دەرپەڕین.
(۲) لەپڕ گورج‌وگۆڵی نواندن؛ لەپڕ خێراكردن؛ لەپڕ بینگرتن:
*( The runners ~ in the last lap.)*
*n.* (۱) فیچقە؛ هەڵقوڵان؛ بە خوڕ لێ هاتن.
(۲) گورج‌وگۆڵی‌یەكی لەپڕ؛ گڤ‌وگوڕێكی كورت‌و لەپڕ.
**spur track,** هێڵێكی كورتی شەمەندەفەری لە هێڵە سەرەكی‌یەكە جیابووەوە.

**spur wheel,** = **spur gear.**
**sputnik** (spoot′nik, sput′nik), *n.* سپوتنیك؛ مانگی دەستكردی سۆڤیێتی.
**sputter** (sput′ẽr), *v.i.* (۱) تف یا خواردەمەنی لە دەم دەرپەڕان لەكاتی قسەكردنی پەلەو بەجۆشدا. (۲) بە پەلەو پەشۆكاوی قسەكردن.
(۳) قرچەقرچ كردن‌و پرژلێبوونەوە (ڕۆنی سوورەوەكراو)؛ پریشك لێبوونەوە (ئاگر).
*v.t.* (۱) تف یا خواردەمەنی لە دەم دەرپەڕاندن لە كاتی قسەكردندا بە پەلەو بەجۆشەوە. (۲) بە پەلەو پەشۆكاوی ووتن.
(۳) پرتەپرت كردن؛ تەقینەوەو كوژانەوە (مەكینە):
*( The engine ~ a few times and died.)*
*n.* (۱) تف یا خواردەمەنی لە دەم دەرپەڕیو لە كاتی قسەكردندا بە پەلەو شڵەژاوی. (۲) قرچەقرچی ڕۆنی سوورەوەكراو.
(۳) تف‌و خواردەمەنی لە دەم دەرپەڕیو؛ پرژی ڕۆنی سوورەوەكراو.
(٤) قسەی پەلەو تێكەڵاووپێكەڵاو؛ گفتوگۆی گەرم‌و شێواو.
**sputum** (spū′təm), *n.* (۱) تف؛ لیك. (۲) بەڵغەم؛ تف‌و بەڵغەم.
**spy** (spī), *v.t.* (۱) سووسەكردن؛ جاسووسی كردن.
(۲) بەدی كردن؛ بینین. (۳) پشكنین؛ لێ ووردبوونەوە؛ تێڕوانین.
(٤) ( ~ **out** ) ، بۆ دەركەوتن (لە ئەنجامی پشكنین یا لێ ووردبوونەوەدا).
*v.i.* (۱) سووسەكردن؛ جاسووسی كردن؛ سیخوڕی كردن.
(۲) چاودێری كردن. (۳) پشكنین؛ لێ ووردبوونەوە؛ باش تێڕوانین.
*n.* (۱) سیخوڕ؛ جاسووس؛ ڕازبەر.
(۲) سووسەیی؛ سیخوڕی؛ جاسووسی.
**spy-glass** (spī′glas′, spī′gläs′), *n.* دووربینی بچووك
**squab** (skwäb, skwôb), *n.* (۱) بەچكە كۆترو باڵندەی تری باڵەفڕە نەبوو. (۲) كەسێكی كورتەبنەو قەڵەو؛ كەسێكی خڕپنە.
(۳) دۆشەكەڵە (بەتایبەتی هی ناو ئوتومبیل)؛ كوشنگ. (٤) قەنەفە.
*adj.* (۱) تازە هەڵهاتوو یا باڵەفڕە نەبوو. (۲) كورتەبنەو قەڵەو؛ خڕپنە.
**squabble** (skwäb′l, skwôb′l), *v.i.* شەڕكردن لەسەر شتی هیچ‌وپووچ؛ دەمقڕە كردن؛ بەیەكداهاتن.
*v.t.* تێكەڵ‌وپێكەڵ كردنی تیپی ڕێكخراو (چاپكاری).
*n.* دەمقڕە؛ دەمەقاڵێ؛ شەڕە قسە؛ ناكۆكی؛ شەڕ لەسەر شتی هیچ‌وپووچ.
**-squabbler** *(n.)*.
**squabby** (skwäb′i, skwôb′i), *adj.* كورتەبنەو قەڵەو.
**squad** (skwäd, skwôd), *n.* (۱) پەل (سوپا).
(۲) تاقم (وەرزش... هتد)؛ دەستە؛ كۆمەڵە.
*v.t.* (۱) تاقم درووستكردن؛ تاقم تاقم كردن؛ دەستەدەستەكردن.
(۲) خستنە تاقمێكەوە.
**squad car,** ئوتومبیلی پاسەوانی‌و سووسەی پۆلیس (بە تەلسزو تەلەفۆنەوە). (پێشی دەووترێ: " **cruiser** " وە " **prowl car** ").
**squadron** (skwäd′rən, skwôd′rən), *n.* (۱) گەلە كەشتی جەنگ.
(۲) لق (لەشكری سوارە). (۳) پۆل (فڕۆكەی جەنگ).
(٤) كۆمەڵە؛ پوورە؛ ژمارەیەكی زۆر؛ گەلە:
*( ~s of flies danced up and down.)*
*v.t.* پۆل پۆل كردن؛ تاقم پێكهێنان؛ دەستەدەستەكردن.
**squalid** (skwäl′id, skwôl′id), *adj.* (۱) پیس‌وپۆخڵ؛ پیس‌و ناخۆش؛ پیس‌و بۆگەن: *( a ~ house, neighborhood, etc.)*.
(۲) كەساس؛ داماو؛ كوڵۆڵ؛ ناخۆش؛ ڕەش‌و ڕووت.
**-squalidity** *(n.)*; **squalidly** *(adv.)*; **squalidness** *(n.)*.
**squall** (skwôl), *n.* (۱) گەردەلوولێكە بە باران یا بەفرەوە؛ بایەكی زۆر قایمە بە بەفر یا بارانەوە.
(۲) [Colloq.]، پشێوی؛ هەراوهوریا؛ بگرەو بەردە؛ ئاشووب.
*v.i.* بایەكی زۆر قایم هەڵكردن (بە باران یا بەفرەوە)؛ گەردەلوول هەڵكردن.
**squall** (skwôl), *v.i.* & *v.t.* قیژاندن؛ هاواركردن؛ زریكان.

n. قیژە؛ هاوار؛ زریکە.

**squally** (skwôl'i), *adj.* (١) گەردەلوولاوی؛ قایم (با)؛ باو باراناوی.
(٢) [Colloq.]. ناشوباوی؛ نائاسوودە.

**squalor** (skwäl'ēr, skwôl'ēr), *n.* پیسوپۆخلی؛ پیس و بۆگەنی؛
کەساسی؛ داماوی؛ پیسی و ناخۆشی؛ رەش و رووتی:
*( to live a life of ~ )*

**squama** (skwā'mə), *n.* پوولەکە، کیانەوەرناسی؛ رووەکناسی)؛
توێکڵ؛ کاژ.

**squamate** (skwā'māt), *adj.* پوولەکاوی؛ پوولەکەدار؛
بە پوولەکە داپۆشراو: *( ~ reptiles)* .

**squamation** (skwə-mā'shən), *n.* (١) پوولەکەداری.
(٢) شێوەی ڕێکخرانی پوولەکە (ماسی).

**squamo-** (skwā'mō, skwā'mə), پێشگرێکە بەمانای: پوولەکە.

**squamosal** (skwə-mō's'l), *adj.* (١) squamous.
(٢) تایبەتی بە ئێسقانی هەردوولای کاسەی سەر.

n. ئێسقانی هەردوولای کاسەی سەر.

**squamose** (skwā'mōs, skwə-mōs'), *adj.* = squamous.

**squamous** (skwā'məs), *adj.* (١) پوولەکەدار؛ پوولەکاوی؛
لە پوولەکە پێکهاتوو. (٢) تایبەتی بە ئێسقانی پوولەکەیی هەردوو کاسەی سەر.

**squamulose** (skwam'yoo-lōs'), *adj.* بە پوولەکەی بچکۆلە
داپۆشراو؛ پوولەکەی بچکۆلەدار.

**squander** (skwän'dēr, skwôn'dēr), *v.t. & v.i.* (١) بە بادان
(پارە)؛ بەفیڕۆدان؛ بەربادکردن؛ لەناودان: *( to ~ one's money)* .
(٢) [Obs.]. پرش و بڵاوکردنەوە.

n. پارە بەبادان؛ پارە بەفیڕۆدان؛ دەستبڵاوی.

**square** (skwâr), *n.* (١) چوارگۆشە (ئەندازە).
(٢) شتێکی چوارگۆشەیی. (٣) گۆڕەپانی ناوشار؛ مەیدان: *( the town ~ )* .
(٤) ڕیزە خانووی بەینی چوار شەقام. (پێشی دەووترێ: " block ").
(٥) دووری ئەم ڕیزە خانووە لە شەقامێکەوە بۆ شەقامێکی تر.
(٦) دەستە سەربازی بە چوارگۆشەیی ڕیز بوو.
(٧) گۆشەی پێوان (ئەندازیاری، دارتاشی... هتد).
(٨) خانە (شەترەنج، دامە... هتد).
(٩) دووجا (بیرکاری): *( 9 is the ~ of 3.)* .
(١٠) [Slang]. کەسێکی کۆنەپەرست (لە بیروباوەڕو جلوبەرگو هەڵوێستی
کۆمەڵایەتیدا)؛ کەسێکە کە شوێن مۆدە ناکەوێ.
(١١) [Obs.]. پێوانە؛ پەیڕەو.

v.t. (١) کردن بە چوارگۆشە؛ وەک چوارگۆشە لێکردن؛ بە چوارگۆشەیی بڕین.
(٢) بە ڕاستی ڕاگرتن؛ ڕاستکردنەوە: *( ~ your shoulders.)* .
(٣) بڕینەوە (حساب، دەفتەرگری)؛ ڕاستکردنەوە:
*( We have ~ed accounts.)*
(٤) قەرزدانەوەو حساب بڕینەوە یا ڕێک کردن:
*( This money will ~ him.)*
(٥) وەک یەک لێکردن؛ هاوتاکردن (خاڵی یاری یا پێشبڕکێ).
(٦) تاقیکردنەوە بۆ ڕێک و ڕاستی (ئەندازە)؛ ڕاستکردنەوە.
(٧) بەراووردکردن؛ تاقیکردنەوە بە بەراووردکردن.
(٨) گونجاندن؛ سازاندن؛ لەگەڵدا گونجاندن یا ڕێکخستن:
*( I can't ~ what he does with what he says.)*
(٩) دووجاکردن (بیرکاری).
(١٠) [Slang]. بەرتیل پێدان.

v.i. (١) بە ڕاستی وەستان؛ پێ کردن لە باری ڕاستی.
(٢) لەگەڵ گونجان؛ لەگەڵ ڕێکەوتن:
*( His actions do not ~ with his words.)*
(٣) هاوتابوون (خاڵی یاری گۆڵف).

adj. (١) چوارگۆشەیی؛ چوارگۆشە. (٢) بەشێوەی گۆشەی وەستاو.
(٣) ڕێک؛ ڕاست. (٤) هەمووی دراوەتەوە (قەرز)؛ پاک لە پاک؛ پاک (قەرز).
(٥) پاک (سەوداگەری)؛ ڕەوا؛ بێ گزی و فێڵ وتەڵەکە: *( a ~ deal)* .
(٦) ڕاستەوڕاست؛ بەبێ پێچوپەنا؛ ڕاست و ڕەوان؛ ڕێک و ڕەوان:
*( a ~ answer, refusal, etc.)*
(٧) پان و تۆکمە.
(٨) دووجایی (بیرکاری).
(٩) چوارگۆشە (پێوانە): *( three ~ feet; five ~ inches)* .
(١٠) [Colloq.]، تێرکەر؛ ئارەزووشکێن؛ باش؛ بەری دڵ گر: *( a ~ meal)*
(١١) [Slang]، کۆنەپەرست (لەڕووی بیروڕاو جلوبەرگو هەڵوێستی
کۆمەڵایەتییەوە)؛ شوێن مۆدە نەکەوتوو.

adv. (١) بە ڕاست و ڕەوانی؛ بە ڕێک و ڕاستی؛ بەبێ پێچوپەنا.
(٢) (ا) ڕووبەڕوو؛ بەرامبەر (ب) لەسەر گۆشەی ڕاست.
(٣) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ: *( She ran ~ into the wall.)* .
(٤) بەبێ ترس و لەرز؛ ڕووبەڕوو؛ بەتوندی:
*( She looked him ~ in the eye and told him to get lost.)*
(٥) بە چوارگۆشەیی؛ لە شێوەی چوارگۆشەدا.

**on the square,** (١) لەسەر گۆشەی ڕاست؛ لەسەر گۆشەی وەستاو؛ ڕێک.
(٢) پاک؛ سەر ڕاست؛ بێ گزی و فێڵ وتەڵەکە؛ ڕێک و ڕاست.
(٣) بە پاکی؛ بە ڕاست و ڕەوانی؛ بە ڕێک و ڕاستی؛ بەبێ پێچوپەنا

**out of square,** (١) لەسەر گۆشەی ڕاست نییە؛ ناڕێک.
(٢) [Colloq.]، نەگونجاو. (٣) [Colloq.]، بە هەڵە.

**square away,** (١) ڕاستکردنەوەی بایەوانی کەشتی و ئامادەبوون بۆ
ڕۆیشتن. (٢) هەمووشتێک ئامادەو ڕێکوپێک کردن.
(٣) هەڵوێستی شەڕ وەرگرتن (بۆکسبازی).

**square off,** خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ یا لێدان (بۆکسبازی).

**square the circle,** (١) چوارگۆشەکردنی بازنە؛ دۆزینەوەی
چوارگۆشەیەک کە ڕووبەرەکەی ئەوەندەی هی بازنەیەک بێ.
(٢) هەوڵدانی کردنی شتێکی زۆر گران.

**square up,** (١) پاک لە پاک کردن؛ پاک کردنەوە (قەرز)؛ دانەوە.
(٢) ڕووبەڕوو وەستان (بۆ شەڕ).

**square bracket,** کەوانەی گۆشەدار.
(وەک ئەم دووانە [ ] ).

**square dance,** سەمای چوارگۆشەیی: سەمایەکی ئەمەریکی چوار ژن و
چوار پیاوییە بە چوارگۆشەیی.

**square circle,** مەیانی بۆکسبازی.

**square deal,** [Colloq.], سەوداگەرییەکی بێ گزی و پێچوپەنا؛
ڕێکەوتنێکی بەویژدانانە؛ ڕەفتار لەگەڵ کردنی سەر ڕاستانەو بێ پێچوپەنا.

**square meal,** ژەمە خۆراکێکی باش و تێرکەر.

**square root,** ڕەگی دووجا (بیرکاری).

**square shooter,** کەسێکی پاک و سەرڕاست و بەویژدان.

**square-shouldered** (skwâr'shōl'dērd), *adj.* چوارشانە.

**square-toed** (skwâr'tōd'), *adj.* (١) لووت پان یا چوارگۆشەیی
(پێڵاو). (٢) کۆنەپەرست؛ ڕێکوپێک؛ لە ڕادە بەدەر سڵکەرەوە لە ڕەفتاردا

**square-toes** (skwâr'tōz'), *n.* کەسێکی کۆنەپەرست و لە ڕادە بەدەر
ڕێکوپێک و سڵکەرەوە.

**squarish** (skwâr'ish), *adj.* وەک چوارگۆشەیە.

**squash** (skwäsh, skwôsh), *v.t.* (١) فلیقاندنەوە؛ پلیشاندنەوە؛
جیق دەرهێنان؛ هاڕین. (٢) دامرکاندنەوە (شۆڕش، بەرهەڵستی)؛ کوژاندنەوە؛
پێشێل کردن. (٣) دەمکوت کردن (بە قسەی ڕەق)؛ بەزاندن.

v.i. (١) پلیشانەوە؛ فلیقانەوە؛ جیق دەرهاتن. (٢) شڵپە هاتن.
(٢) دڕپێدان؛ بە زۆر خۆ پێداکردن.

n. (١) شتێکی بە ئاسانی فلیقێنراوە یا پلیشێنراوە.
(٢) تلپە؛ تلپ؛ ملتە. (٣) فلیقانەوە؛ پلیشانەوە؛ جیق دەرهاتن.
(٤) دەنگی فلیقانەوە.
(٥) [British]، خۆشاوی لیمۆی تێکەڵاو بە شتی تر: *( a lemon ~ )*
(٦) سکواش: یارییەکە لە تەنس و تۆپێنی دەست دەچێت.

**adv.** بە دەنگێکی وەك فلیقانەوە یا پلیشانەوە.

**squash** (skwäsh, skwôsh), ***n.*** (١) کوولەکە؛ کوولەکەی مل باریك. (٢) رووەکی کوولەکە

**squash bug,** مێرووی کوولەکە: مێروویەکی زیانبەخشە بۆ کوولەکەو رووەکی تر

**squashy** (skwäsh′i, skwôsh′i), ***adj.*** (١) نەرمو نۆل. ***( ~ cushions )***

(٢) تەرو نەرم؛ لیقن.

(٣) بن. زۆر گەییو؛ بوردوو. ***( ~ melons )***.

-squashily ***(adv.)***; squashiness ***(n.)***.

**squat** (skwät, skwôt), ***v.i.*** (١) هەلتروشکان؛ هەلتووتان؛ بە چیچکانەوە دانیشتن. (٢) دەستبەسەرداگرتنی خانوو زەوی‌وزاری چۆل بەبێ تاپۆو بەبێ کرێدان. (٣) داگیرکردنی زەوی‌وزاری میری بە نیازی تاپۆ کردنی

**v.t.** خۆهەلتروشکان؛ خۆهەلتووتان.

**adj.** (١) هەلتروشکاو؛ هەلتووتاو؛ بە چیچکانەوە دانیشتوو.

(٢) (ا) نزم. (ب) کورتو ئەستوور یا قورس.

**n.** هەلتروشکان؛ هەلتووتان؛ بە چیچکانەوە دانیشتن.

**squatter** (skwät′ẽr, skwôt′ẽr), ***n.*** (١) کەسێکی هەلتروشکاو یا بە چیچکانەوە دانیشتوو. (٢) (ا) کەسێکە کە دەست بەسەر خانووو زەوی‌و زاری چۆلدا دەگرێ‌و تێیدا دادەنیشێ بەبێ کرێ‌و بەبێ تاپۆ؛ داگیرکەری خانووی چۆل. (ب) داگیرکەری زەوی‌وزاری میری بە نیازی تاپۆکردنی.

**squatty** (skwät′i, skwôt′i), ***adj.*** (١) نزم؛ داکەوتوو.

(٢) کورتو ئەستوور.

**squaw** (skwô), ***n.*** (١) ژنێکی هیندی ئەمەریکی.

(٢) ژن (لەرووی گاڵتەوە)؛ ئافرەت

**squaw-fish** (skwô′fish′), ***n.*** ماسی‌یەکی رووباری باریك‌و درێژکۆلەیە

**squawk** (skwôk), ***v.i.*** (١) قیراندن (وەك مریشك‌و تووتی)؛ قیرەقیرکردن.

(٢) [Slang]. سکاڵاکردن بە توندوتیژی؛ بۆڵەبۆڵ کردن

**n.** (١) قیرە؛ قیرەقیر.

(٢) [Slang]. سکاڵای توندوتیژ؛ بۆڵەبۆڵ.

**squaw man,** پیاوێکی سپی‌یە کە ژنی هیندی ئەمەریکی هێنابێ.

**squeak** (skwēk), ***v.i.*** (١) جووکەجووك کردن (وەك مشك)؛ جیکەجیك هاتن؛ زیقەزیق کردن. (٢) جیرەجیرکردن (دەرگا)؛ جیرەهاتن؛ جیراندن. (٣) [Slang]، نهێنی درکاندن؛ خەبەرلێدان؛ تووش کردن.

(٤) بە ئاستەم سەرکەوتن یا دەربازبوون؛ بە ئاستەم دەرچوون.

**v.t.** (١) زیقەزیق کردن؛ بە زیقەزیقەوە ووتن. (٢) جیرە لێ هەڵساندن (دەرگا).

**n.** (١) جیکە؛ جووکە؛ زیقە؛ جیرە. (٢) بە ئاستەم رزگاربوون.

**narrow (or close, near) squeak,** [Colloq.], بە ئاستەم دەربازبوون؛ بە ئاستەم رزگاربوون

**squeaky** (skwēk′i), ***adj.*** جووکەجووککەر؛ زیقەزیقاوی؛ جیرەجیرکەر. ***( a ~ floor, door, table, pair of shoes, etc.)***

-squeakily ***(adv.)***; squeakiness ***(n.)***.

**squeal** (skwēl), ***v.i.*** (١) قیژاندن؛ زیقاندن؛ زریکاندن؛ جیقەجیق کردن.

(٢) [Slang]. خەبەرلێدان؛ تووش کردن؛ پێوەکردن: ***( He ~ on his classmates to the teacher.)***

(٣) سکاڵاکردن؛ بۆڵەبۆڵ کردن.

**v.t.** (١) قیژاندن؛ شیراندن؛ زریکاندن.

(٢) زریکە لێ هەڵسان. ***( ~ing the tires)***.

**n.** قیژە؛ زریکە؛ شیرە؛ جیقەجیق.

-squealer ***(n.)***.

**squeamish** (skwēm′ish), ***adj.*** (١) زوو دڵ تێکچوو؛ دڵ تێکەڵهاتوو؛ زوو دەرشێتەوە. (٢) خۆی بە سەنگین دادەنێ‌و بێزی لە گەلێك رەووشت دەبێتەوە؛ زوو زویر دەبێ لە رەوشتێك کە لای ناشرین بێ؛ بەقێزوبێز (مەجاز).

(٣) بەقێزوبێز.

**squeegee** (skwē′jē, skwē-jē′), ***n. Also*** **squilgee,** (١) لاستیکی شووشە سڕین. (٢) خولخولۆکەی لاستیك؛ وێنەگرو وێنەهەڵکەر بەکاری دەهێنن بۆ سڕین.

**squeeze** (skwēz), ***v.t.*** (١) ووشین؛ گوشین؛ ئاو لێ گرتن؛ هەڵگوشین: ***(to ~ a lemon dry)***

(٢) لێ دەرهێنان بە گوشین یا بادان: ***( She ~ water from the clothes.)***.

(٣) بە زۆر لێسەندن؛ رووتکردنەوە.

(٤) گوشین؛ ووشین. ***( to ~ a person's hand)***.

(٥) چەوسانەوە یا زۆر بۆ هێنان (بە داخوازی یا باجی ناڕەوا... هتد)؛ زۆرلێکردن؛ بەگیرهێنان. (٦) باوەش پیاکردن؛ هەڵگوشین؛ هەڵگلۆفتن.

(٧) وێنەی دەقاودەق دەرهێنان (بە شتێکی نەرم خستنەسەر شتێکی رەق‌و پەستانەوە). (٨) [Colloq.]، بە زۆر پێ کردن؛ زۆرلێکردن.

(٩) بە زۆر خۆ پیاکردن؛ دڕپێدان‌و بە زۆر چوونەژوورەوە؛ بە زۆر تێ چوون؛ تێ ترنجاندن

**v.i.** (١) گوشران؛ ووشران؛ پسان؛ فلیقانەوە (مەجاز).

(٢) زۆر خستنەسەر؛ زۆرکردن.

(٣) ( ~ in; ~ out; ~ through )، بە زۆر خۆ پیاکردن؛ دڕپێدان‌و بە زۆر چوونەژوورەوە؛ بە زۆر تێخستن؛ تێ ئاخنین؛ پەستن؛ پەستانەوە؛ تێ ترنجان: ***[ to ~ (one's way) through a crowd; Can I ~ in?]***

(٤) بە ئاستەم بردنەوە، دەرچوون، سەرکەوتن یا دەربازبوون: ***( The bill barely ~ed through.; We barely ~ed by.)***

**n.** (١) گوشین؛ ووشین؛ هەڵگوشین.

(٢) (ا) باوەش پیاکردن؛ هەڵگلۆفتن؛ هەڵگوشین. (ب) دەست گوشین

(٣) (ا) تێ ترنجان؛ تێ ئاخنین؛ سیخناخ؛ پەستن.

(ب) جەنجاڵ؛ قەرەباڵغی‌یەکی ئێجگار زۆر.

(٤) وێنەی دەقاودەق (کە بە پەستانەوەی شتێکی نەرم بە سەر شتێکی رەقەوە دەردەهێنرێ). (٥) (ا) گوشراو؛ خۆشاو. (ب) نەخت؛ تۆسقاڵ؛ تۆز

(٦) [Colloq.]، زۆر بۆ هێنان؛ زۆرلێکردن (رووتکردنەوە)؛ بەگیرهێنان؛ زۆر.

-squeezable ***(adj.)***; squeezer ***(n.)***.

**squeeze play,** بەگیرهێنان بۆ پارە یا شتی تر لێسەندن؛ زۆر بۆ هێنان (بۆ رووتکردنەوە یا ئامانجی تری خۆ بەجێهێنان).

**squelch** (skwelch), ***n.*** (١) شلقە؛ شلقەشلق؛ فلقەفلق (وەك دەنگی بە لیتاودا رۆیشتن). (٢) تۆپەڵە شتی فلیقاوە. (٣) وەڵامی توندوتیژو دەمکوتکەر؛ دەمکوت؛ قوڕوقەپ پێکەر؛ پیاهەڵشاخان.

**v.t.** (١) فلیقاندنەوە؛ پلیشاندنەوە؛ هاڕین؛ شێلان‌و جیق دەرهێنان.

(٢) (ا) کوژاندنەوە (شۆڕش، ئاشووب)؛ پێشێل کردن.

(ب) دەمکوت کردن؛ قوڕوقەپ پێکردن.

**v.i.** (١) شلقەشلق لێوەهاتن؛ فلقەفلق هاتن؛ فلقەکردن.

(٢) بەناو لیتاو یا قوڕاودا رۆیشتن‌و شلقەشلق لێ هەڵسان؛ بە پێڵاوی تەڕەوە رۆیشتن‌و فلقە لێ هەڵسان.

-squelcher ***(n.)***.

**squib** (skwib), ***n.*** (١) (ا) فیشەکەشێتە. (ب) فیشەکەشێتەیەکە کە دەسووتێ بەڵام ناتەقێتەوە. (٢) داشۆرین؛ شۆرین (بە قسە).

***v.i. & v.t.*** (١) فیشەکەشێتە تەقاندن؛ تەقینەوە.

(٢) داشۆرین؛ باش شۆردن (بە دەم).

**squid** (skwid), ***n.*** سکوید: گیاندارێکی دەریایی نەرمی دە پەل قاوغدارە دەخورێت‌و بۆ دانەخۆرەی راوەماسیش بەکاردێت.

**squiggle** (skwi′g′l), ***v.t. & v.i.*** بە قلی‌وبلی نووسین یا نیگارکێشان؛ بە خواروخێچ نووسین یا وێنەکێشان.

**n.** هێڵێکی خواروخێچ؛ نووسینی قلی بلی.

**squiggly** (skwig′li), ***adj.*** خواروخێچ.

**squill** (skwil), ***n.*** (١) رووەکێکە لە توخمی شلێر.

(٢) سەلك یا پیازۆکەی ئەم رووەکە (بۆ دەرمان بەکاردێت).

**squilla** (skwil′ə), ***n.*** چەند جۆرە گیانداریكی قاوغداری دەریایی كون هەڵكەنن لە تەنكاودا.

**squinch** (skwinch), ***n.*** كەوانە یا تاقی قوژبنی ژوور.

**squint** (skwint), ***v.i.*** (١) چاو هێنانەوەیەك و سەیركردن: سەیركردن بە درزێكی چاو: چاو نیمچە نووقان و سەیركردن
(٢) بە تیلەی چاو سەیركردن (٣) خێل بوون.
(٤) لایەنگری كردنی لایەك: حەز بە لایەك كردن: بەرەو لایەك چوون.
(٥) لە رێ لادان: لە رێبازێكی تایبەتی لادان.

***v.t.*** درزێك لە چاودا هێشتنەوە و تێ نواڕین.

***n.*** (١) بە تیلەی چاو سەیركردن: بەدڵ نەبوون.
(٢) بە درزێكی چاو تەماشاكردن (٣) مەیل: حەز
(٤) مەیل یا حەزی چەوت. (٥) خێلی: خێلیتی.

***adj.*** (١) بە تیلەی چاو سەیركەر: ناڕازی
(٢) خێل: چاو تیل: چاو چەپ و ڕاست

**squint-eyed** (skwint′īd′), ***adj.*** (١) خێل: چاو تیل: چاو چەپ و ڕاست (٢) بە تیلەی چاو سەیركەر: ناحەز: كیناوی: بەدخوا.

**squire** (skwīr), ***n.*** (١) قەڵغان هەڵگری سوارچاك (كە بە ئاسایی كوڕێكی خانەدان بووە): بەردەستی سوارچاك. (٢) (ا) بەردەستی پیاوێكی گەورە.
(ب) جوامێر: جوامێری هاودەمی خاتوونێك (كە بە ئاسایی پیاوێكی دڵسۆز بووە بۆی (٣) ئاغا: كوێخا: دەرەبەگ: نازناوی خاوەن زەوی و زارێكی ئینگلیزییە (٤) دادپرس (لە ئەمەریكادا).

**squirearchy** (skwīr′är-ki), ***n.*** (١) چینی ئاغا و دەرەبەگ: ئاغاگەل.
(٢) ڕژێمی ئاغا و دەرەبەگان

**squireling** (skwīr′liŋ), ***n.*** دەرەبەگی بچووك.

**squirm** (skwũrm), ***v.i.*** (١) پێچ و لوول خواردن (وەك لەشی كرم و مار لە خشاندا یا لە بەگیرهاتندا): خۆ كرژكردن: تلانەوە (وەك بە ئێش و ئازارەوە).
(٢) خۆبادان و خۆ كرژكردن لە تەریقی و شەرمەزاریدا: ناڕەحەتی و بێ ئارامی پیشاندان

***n.*** پێچ و لوول خواردنی لەش: تلانەوە (وەك بە ئێش و ئازارەوە): خۆ كرژكردن.

**-squirmy** ***(adj.).***

**squirrel** (skwũr′əl, skwũrl), ***n.*** (١) سمۆرە. (٢) كەوڵی سمۆرە.

**squirrel monkey,** سمۆرە مەیموون: مەیموونێكی بچووكی تووك نەرمی كلك درێژی دەموو چاو سپی لووت ڕەشی ئەمەریكای خواروو.

**squirt** (skwũrt), ***v.t. & v.i.*** (١) فیچقەكردن: بە فیچقە هاتنەدەرەوە.
(٢) تەڕكردن بە فیچقە (مرۆڤ، شت): ئاو لێ هەڵپرژان: فیچقە پیاكردن.

***n.*** (١) فیچقە (ئامێر) (٢) فیچقە پیاكردن: لێ هەڵپرژان.
(٣) فیچقە ئاو، شلە): شلەی بە فیچقە هاتەدەرەوە.
(٤) [Colloq.]. هەرزەیەكی بێ حەیا و بێ نەزاكەت: كەسێكی هیچ و پووچی لووت بەرز

**squirt gun,** (١) دەمانچەی ئاو (٢) ئامێری هەڵپرژێن.

**squish** (skwish), ***v.t. & v.i., n.*** [Dial.]. = squash.

**sri** (shrē), ***n.*** گەورەم . ووشەی بانگ كردنی هیندییە.

**stab** (stab), ***v.t.*** (١) چەقۆلیدان: خەنجەرلێدان
(٢) پیاكردن (چەقۆ، خەنجەر)

***v.i.*** (١) چەقۆلێدان: خەنجەرلێدان.
(٢) پلدان: لە ئێش و ئازارا بوون (وەك لە چەقۆلێدانەوە).

***n.*** (١) برینی چەقۆلێدان. (٢) پیاكردن (چەقۆ، خەنجەر): لێدان.
(٣) ئێش و ئازاری تیژ و كوتوپڕ.
(٤) [Colloq.]. هەوڵ: تاقیكردنەوە: ***( to take a ~ at a question)*** .

**-stabber** ***(n.).***

**stabile** (stā′bil, stab′il), ***adj.*** (١) نەبزوك: نەبزووت: جێ نەگۆڕ: جێگیر: چەسپاو (٢) گەرما كاری تێ ناكات: نەگۆڕ

**stability** (stə-bil′ə-ti), ***n.*** (١) جێگیری: چەسپاوی: چەسپان: هیچ كار تێ نەكردن (٢) (ا) نەگۆڕان (مرۆڤ): خۆڕاگرتن.
(ب) پشت پێ بەستران. (٣) ئاسایش: ئاسوودەیی: ئارامی.

(٤) بەڵێنی ووشكەسۆفی بە مانەوە لە هەمان پەرستگادا بە درێژی ژیانی.

**stabilize** (stā′bə-līz′, stab′ə-līz′), ***v.t.*** (١) چەسپاندن: جێگیركردن: قایم كردن. (٢) چەسپاندن (نرخ): لە گۆڕان كەمكردنەوە.
(٣) لەنگەرگرتن یا ڕاگیركردنی فڕۆكە.

***v.i.*** جێگیربوون: چەسپان.

**-stabilization** ***(n.).***

**stabilizer** (stā′bə-līz′ēr, stab′ə-līz′ēr), ***n.*** (١) چەسپێنەر: جێگیركەر. (٢) لەنگەری فڕۆكە: ئامێری ڕاگیركردن و لەنگەرگیری فڕۆكە و كەشتی.
(٣) (ا) ماددەیەكە دەكرێتە تەقەمەنییەوە بۆ ئەوەی هەر لە خۆیەوە نەتەقێتەوە.
(ب) ماددەیەكە دەكرێتە ماددەی تری كیمیاوییەوە بۆ ڕاگرتنی لە دۆخی خۆیدا.

**stable** (stā′b'l), ***adj.*** (١) جێگیر: چەسپاو: چەسپیو: قایم.
(٢) خۆڕاگر: نەگۆڕ (مرۆڤ): پشت پێ بەستراو: یەك دڵ. (٣) ئارام: ئاسوودە.
(٤) نەگۆڕ: بەردەوام: هەمیشەیی. (٥) لەنگەرگیر: لەنگەرگر.
(٦) شی نەبووەوە (كیمیا): دانەوەشاو: نەگۆڕ.

**stable** (stā′b'l), ***n.*** (١) تاوڵە: تەویلە: گەوڕ.
(٢) وولاخی تاوڵە: گشت وولاخی تەویلەیەك.
(٣) گشت ئەسپی غارغارێنی كەسێك.
(٤) مەیتەرەكانی ئەسپی غارغارێنی تاوڵەیەك.

***v.t.*** كردنە تاوڵەوە: لە تاوڵە یا گەوڕدا ڕاگرتن.

***v.i.*** لە تاوڵەدا بوون: كرانە تاوڵەوە یا گەوڕەوە.

**stableboy** (stā′b'l-boi′), ***n.*** هەرزەی تاوڵە: منداڵی بەردەستی تاوڵە.

**stableman** (stā′b'l-man′, stā′b'l-mən), ***n.*** مەیتەر

**stabling** (stā′bliŋ), ***n.*** (١) تاوڵە: تاوڵەكان: گەوڕ.
(٢) جێی ڕاگرتنی ئەسپ لە تاوڵەدا: جێگە و ڕێگەی ناو تەویلە.

**stablish** (stab′lish), ***v.t.*** [Archaic]. = **establish.**

**staccato** (stə-kä′tō), ***adj.*** (١) پچڕپچڕ (مۆسیقا): ***( a series of ~ notes)***
(٢) پچڕپچڕ: یەك لە دوای یەك: پەستا پەستا: ***( a ~ outburst of rage, gunfire, etc.)***

***n.*** شتی پچڕپچڕ (گفتوگۆ، مۆسیقا، تەقەی تفەنگ).

**stack** (stak), ***n.*** (١) مەلۆ: خەرمان: شارا: گوررزە.
(٢) بەستەك: كۆمەڵ: لیژنە: كەڵەك: بەند: ***( a ~ of books, papers, etc.)***
(٣) سێ تفەنگی هەڵسپێرراو وەك سێپا.
(٤) پێوانەیەكی دار و خەڵووزی ئینگلیزییە.
(٥) (ا) ڕیزە دووكەڵ كێشی سەر سەربان. (هەروەها " smoke-stack " ).
(ب) دووكەڵ كێشی سەر كەشتی: مەكینەی خۆ بزوێن... هتد.
(٦) ڕیزە ڕەفەی كتێب (لە كتێبخانەدا).
(٧) (pl.)، بەشی كتێب هەڵگرتنی كتێبخانەیەك.
(٨) [Colloq.]، كەڵەك: ژمارەیەكی زۆر: كۆمەڵە.

***v.t.*** (١) كەڵەكەكردن: بەستەك كردن: هەڵچنین (لیژنە دار، بەرد، كتێب، خشت): كۆمەڵ كردن. (٢) باركردن: لێ باركردن. (٣) گزی كردن (قومار، یاری كاغەز).

**stack up,** (١) كردنە ئەوەندە (ژمێرە): ئەوەندەبوون: كۆكردنەوە.
(٢) هاوتابوون: خۆ لەقەرەدان: شان لە شان دان.

**stack the cards; stack the deck,** (١) بە دزییەوە ڕێكخستنی كاغەزی یاری و قومار بۆ گزی كردن: گزی كردن. (٢) پێشەكی ڕێكخستنی شتێك یا كارێك بە ناڕەوایی بۆ سەرخستن یا ژێرخستنی لایەك لە ناكۆكی یا پێشبڕكێیەكدا.

**staddle** (stad′'l), ***n.*** (١) جێ خەرمان و شارا: بنی خەرمان و شارا یا گزرە (بەتایبەتی كە لەسەر بەرزەكێك كەڵەكە كرابێ). (٢) پاڵپشت: كۆڵەكە

**stadholder** (stad′hōl′dēr), ***n.*** *Also* **stadtholder,** (١)- فەرمانڕەوای كۆنی هەرێمێكی هۆڵەندە. (٢) سەرەك دادوەری هۆڵەندە.

**stadia** (stā′di-ə), ***n.*** (١) دووری پێو (رووپێوی): شیشی دووری پێو.
(٢) دووری پێوان بە شیشی دووری پێو.

**stadia** (stā′di-ə), ***n.*** *plural of* **stadium.**

**stadiometer** (stā′di-om′ə-tēr), ***n.*** (١) ئامێری پێوانی گۆشە:

گۆشەپێوەر. (٢) ئامێری پێوانی هێڵی چەماوەو پێچرپێچ.
**stadium** (stā′di-əm), *n.* (١) خولگەی ڕاکردن یا پێشبڕکێ (لە یۆنانی کۆندا دەورەی درابوو بە پلەپلەی دانیشتن). (٢) پێوانەیەکی یۆنانی کۆنە (بریتییە لە ٦٠٧ پێ). (٣) یاریگای پلەپلە (بۆ دانیشتنی سەیرکەران)؛ وەرزشگای سەرکراوەی پلە دار یا تەلاندار. (٤) قۆناغی نەخۆشی.
**stadtholder** (stat′hōl′dẽr), *n.* = stadholder.
**staff** (staf, stäf), *n.* (١) (ا) داردەست؛ گۆچان. (ب) کوتەک؛ گورز (ج) دارئالا. (د) گورزی پاشاو پیاوی گەورەی تر. (ه) [Archaic]، قەدی ڕم یا نێزە. (و) داری پێوان.
(٢) پاڵپشت؛ پشتیوان. *( He was a ~ to the whole group.)*
(٣) دەستەی فەرمانبەران؛ دەستەودایەرە.
(٤) دەستەیەک فەرمانبەرانی تایبەتی:
*( a teaching ~ ; office ~ ; maintenance ~ )*
(٥) دەستە هێڵی ئاسۆیی کاغەزی مۆسیقا لەسەر نووسین (کە پێنج هێڵن).
*adj.* هی دەستەی فەرمانبەران.
*v.t.* فەرمانبەر بۆ دانان؛ کارگەر بۆ تەرخان کردن؛ فەرمانبەر پێدان.
**staff** (staf, stäf), *n.* گەچ (خانووسازی).
**staffer** (staf′ẽr), *n.* فەرمانبەر؛ ئەندامی دەستەی فەرمانبەرانی دەسگایەک.
**staff of life,** نان.
**staf sergeant,** چاوەش.
**stag** (stag), *n.* (١) نێرە ئاسک. (٢) یەختە؛ گیانداری خەساو.
(٣) (ا) پیاوێکە کە بە تەنها دەچێتە ئاهەنگ، واتە، ژن لەگەڵ خۆی نابات. (ب) ئاهەنگی پیاوان.
*adj.* تەنها بۆ پیاوان (ئاهەنگ)؛ هی پیاوان: *( a ~ party)* .
*v.t.* [Slang], شوێن کەوتن بۆ سووسەکردن؛ سووسەکردن؛ جاسوسی بەسەرەوە کردن.
*v.i.* چوونە ئاهەنگ بە تەنها، واتە، بەبێ ژن لەگەڵ خۆ بردن.
**go stag,** [Colloq.], بە تەنها چوونە ئاهەنگ، واتە، ژن لەگەڵ خۆ نەبردن.
**stage** (stāj), *n.* (١) سەکۆ؛ بەرزەک.
(٢) داربەست (خانووسازی)؛ داربەند؛ نهسکەلە (خانووسازی). (٣) نهۆم.
(٤) ئەو بەشەی گەردبینە کە شتی لەسەر دادەنرێ بۆ تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی.
(٥) شانۆ
(٦) شانۆگەری؛ پیشەی شانۆگەری و نواندن.
(٧) شوێنی ڕوودان: *( Europe has been the ~ for many wars.)* .
(٨) کاروان سەرا؛ شوێنی لادانی بەینی دوو قۆناغە ڕێ.
(٩) قۆناغ؛ قۆناغە ڕێ.
(١٠) (ا) stagecoach (ب) پاس.
(١١) پلە؛ قۆناغ: *( an advanced ~ of cancer)* .
(١٢) بەشێکی مووشەک. (١٣) چین (زەمینناسی).
*v.t.* (١) پێشکەش کردن یا پیشاندان لەسەر شانۆ: *( to ~ a play)* .
(٢) پێ هەڵسان؛ کردن؛ ڕێکخستن:
*( to ~ a demonstration, an invasion, attack, etc.)*
*v.i.* (١) بۆ پیشاندان لەسەر شانۆ شیان: *( The play ~s well.)* .
(٢) بە گالیسکەی قۆناغ قۆناغ هاتوچۆکردن.
**by easy stages,** بە قۆناغی بچووک بچووک؛ وورده وورده؛ لەسەرخۆ.
**stage-coach** (stāj′kōch′), *n.* گالیسکەی گەشتی قۆناغ قۆناغ؛ گالیسکەیەکی هاتوچۆیە بۆ خەڵک و پۆستە گواستنەوە بە ڕێکوپێکی.
**stage-craft** (stāj′kraft′, stāj′kräft′), *n.* شانۆگەری؛ پیشەی شانۆگەری؛ هونەری شانۆنامە نووسین و پێشکەش کردن.
**stage direction,** (١) ئامۆژگاری شانۆ: ئامۆژگاری دەربارەی نواندنی شانۆنامەو کرداری نوێنەرەکان (کە لە دەقی شانۆنامەکەدا دەنووسرێت)
(٢) سەرپەرشتی کردنی نواندنی شانۆنامە.
**stage director,** کارگێڕی شانۆ
**stage door,** دەرگای پشتەوەی شانۆ

**stage fright,** ترسی شانۆ.
**stage-hand** (stāj′hand′), *n.* کارگەری شانۆ: کەسێکە ئیش لەسەر دیمەن و چراو شتی تری شانۆ دەکات کە پێویستە بۆ پێشکەش کردنی شانۆنامەیەک.
**stage manager,** کارگێڕی شانۆ.
**stager** (stāj′ẽr), *n.* (١) کەسێکی قاڵ یا شارەزا.
(٢) [Archaic]، نوێنەر؛ ئەکتەر.
**stage-struck** (stāj′struk′), *adj.* شێتی شانۆ؛ زۆر حەز بە نوێنەری یا ئەکتەری دەکات.
**stage whisper,** (١) چپەی شانۆیی: چپەیەکی سەر شانۆی بیستراو لەلایەن گوێگرەکانەوە. (٢) چپەی بیستراو (لەلایەن خەڵکی تریشەوە)
**stagey** (stāj′i), *adj.* = stagy.
**staggard** (stag′ẽrd), *n. Also* staggart, نێرە ئاسکێکی چوارساڵە.
**stagger** (stag′ẽr), *v.i.* (١) لەتردان؛ بەملاو بەولادا کەوتن؛ لارەولارکردن؛ بە لارەولار ڕۆیشتن؛ لابەلا ڕۆیشتن.
(٢) دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن.
*v.t.* (١) لەتر پێدان (وەک بە مستەکۆڵە پیاکێشان)؛ بەملاو بەولادا خستن.
(٢) واق وورماندن؛ حەپەساندن؛ سەرسوڕماندن.
(٣) بە لابەلا ڕیزکردن یا ڕێکخستن؛ لەم دیوو لەو دیوی هێڵێکەوە ڕیزکردن بە جۆرێک کە پێچاوپێچ یا لابەلا بنوێنێ:
*( Theatre seats are ~ed for clear viewing.)*
(٤) بەین تێخستن؛ تێکهەڵکێشان بە جۆرێک کە بەینی تێ بکەوێ:
*( Employees' vacation periods have been ~ .)*
*n.* (١) لەتر؛ لەتردان؛ بەملاو بەولادا کەوتن؛ لارەولارکردن.
(٢) ڕیزی پێچاوپێچ؛ بزوانی پێچاوپێچ یا ئەملاو ئەولا.
(٣) (*pl.*) ، سەرەخولەی ئەسپ و ڕەشەووڵاخ.
**stagger-bush** (stag′ẽr-boosh′), *n.* بنچکێکی ژەهراوییە ڕەشەووڵاخ تووشی سەرە خولێ دەکات.
**staggering** (stag′ẽr′iŋ), *adj.* ئێجگار زۆر؛ بێ شومار؛ واق وورمێن؛ سەرسوڕمێن: *( The death rate among children was ~ .)* .
**stag-hound** (stag′hound′), *n.* تانجی ڕاوە ئاسک.
**staging** (stāj′iŋ), *n.* (١) تەختەبەندی سەردەمی؛ چوارچێوەی لەسەر وەستان؛ بەرزەک. (٢) کارگێڕیی گالیسکەی هاتوچۆ.
(٣) گەشتکردن بەم جۆرە گالیسکانە.
(٤) شانۆنامە پێشکەش کردن یا نواندن.
**staging area,** شوێنی کۆبوونەوەو ئامادەکردنی لەشکر پێش هێرش بردن.
**stagnancy** (stag′nən-si), *n.* وەستان (ئاو)؛ وەستاوی؛ پەنگخواردنەوە.
**stagnant** (stag′nənt), *adj.* (١) وەستاو (ئاو)؛ ڕاوەستاو؛ پەنگخواردووەوە: *( ~ water)* .
(٢) بۆگەن (ئاو بەهۆی پەنگخواردنەوەوە)؛ پیس.
(٣) مردوو (مەجان)؛ خاو؛ سست؛ نەبزۆک؛ سارد (بازاڕ)؛ هێواش:
*( a ~ mind; a ~ economy)*
**stagnate** (stag′nāt), *v.i.* بۆگەن کردن (بەهۆی پەنگخواردنەوەوە)؛ لە چالاکی کەوتن؛ سست بوون: *( The water ~s.; The mind ~s )* .
*v.t.* بۆگەن پێکردن.
**stagnation** (stag-nā′shən), *n.* (١) بۆگەن کردن (بەهۆی پەنگ خواردنەوەوە)؛ نەبزۆکی؛ سستی؛ خاوی؛ مردن (مەجان).
(٢) دۆخی بۆگەن کردن یا نەبزۆکی.
**stagy, stagey** (stāj′i), *adj.* (١) شانۆیی؛ هی خۆنواندن.
(٢) دەستکرد؛ بۆ پۆزلێدان یا خۆدەرخستن کراوە؛ درۆزنە؛ ڕووالەتی
**staid** (stād), *archaic past tense and p.p. of* stay
*adj.* (١) نەگۆڕ؛ جێگیر؛ چەسپاو.
(٢) سەلار؛ سەنگین؛ خۆڕاگر؛ ئاغر؛ ڕێکوپێک.

**stain** (stān), *v.t.* (١) لەکەدارکردن؛ پیس کردن؛ پەڵە لێدان.
(٢) ناو پیس کردن؛ لەکەدارکردن. (٣) ڕەنگ کردن؛ بۆیەکردن.
(٤) ڕەنگ کردنی شتی ووردو بێ ڕەنگ (بۆ تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی بە گەردبین).
*v.i.* ڕەنگ گرتن
*n.* (١) پەڵە؛ لەکە. (٢) لەکە؛ ناو پیسی؛ ناوزڕان.
(٣) (ا) ڕەنگ (بۆ ڕەنگ کردنی دارو تەختەو قوماش)؛ بۆیە.
(ب) ڕەنگ (بۆ ڕەنگ کردنی شت بۆ تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی بە گەردبین).
**stained glass,** شووشەی ڕەنگ کراو (وەك هی پەنجەرەی کڵێسەو هەندێ خانوو)
**stainless** (stān′lis), *adj.* (١) بێ لەکە؛ بێگەرد؛ بێ پەڵە؛ پاك.
(٢) ژەنگ نەگر؛ ژەنگ هەڵنەهێن؛ نەخوراوە (کانزا).
**stainless steel,** پۆڵای ژەنگ نەگر؛ پۆڵای ژەنگ هەڵنەهێن.
**stair** (stâr), *n.* (١) (*pl.*). staircase .
(٢) پلەی پێ پلیکانە؛ پلەی قالدرمە.
**staircase** (stâr′kās′), *n.* پێ پلیکانە؛ پێ پیلکە؛ قالدرمە.
**stairhead** (stâr′hed′), *n.* تەوقەسەری پێ پلیکانە.
**stairway** (stâr′wā′), *n.* = staircase.
**stairwell** (stâr′wel′), *n.* بیری پێ پلیکانە: ئەو بۆشاییەیە کە پێ پلیکانەی خانوویەکی چەند نهۆمی تێدایە؛ قووڵگەی پێ پلیکانە.
**stake** (stāk), *n.* (١) سنگ؛ مێخ؛ سنجووق؛ بەڕوولەی دەوار.
(٢) سنگ یا داری تاوانکار پێوە بەستنەوەو سووتاندن.
(٣) سووتاندنی تاوانکار بە بەستنەوەی بە سنگێك یا ستوونێکەوە.
(٤) شیش سنگی پشت لۆری و فارگۆنی پشت بەتاڵ بۆ ڕاگرتن و نەکەوتنە خوارەوەی بار.
(٥) (*pl*). پارەی گرەو لەسەرکراو؛ گرەو:
*( The gamblers were playing for high ~s.)*
(٦) (*pl*) خەڵات (پێشبڕکێ).
(٧) پێشبڕکێیەکە کە براوە خەڵاتی تیا وەرگرێ.
(٨) بەش یا سوود (لە سەرکەوتنی پرۆژەیەکی دارایی مەترسیدار، دەسگایەك، کارێك، یا وڵاتێکدا): *( to have a ~ in a company)* .
(٩) [Colloq.]. grubstake .
*v.t.* (١) نیشانەکردن و کردن بە هی خۆ (شوێن، سنوور).
(٢) قایم کردن (بە سنگ)؛ چەسپاندن؛ دار دانە بەر بۆ پاڵپشتی.
(٣) بەستنەوە (بە سنگ یا دارەوە).
(٤) ( ~ in; ~ out )، سنوور گرتن؛ شوورە بۆ کردن؛ پەرژین کردن.
(٥) گرەو لەسەرکردن؛ خستنە مەترسییەوە:
*( He ~ his wealth on the outcome of this race.)*
(٦) [Colloq.]. grubstake .
**at stake,** لە مەترسیدایە؛ مەترسی لێ دەکرێ:
*( Our lives were at stake.)*
**pull up stakes,** [Colloq.], گواستنەوە (ماڵ، دەوار، هەوار، کارو کاسبی... هتد).
**stake body,** لۆری سەر بەتاڵی دەور بە شیش یا سنگ گیراو بۆ نەکەوتنە خوارەوەی بار.
**stake-holder** (stāk′hōl′dēr), *n.* گرەوگر کەسێکە پارەی گرەو لەسەر کراوی لا دادەنرێت تا ئەنجامی گرەوەکە دەردەکەوێت.
**stake out,** چاودێری کردن لەلایەن پۆلیسەوە.
**stalactitle** (stə-lak′tīt, stal′ək-tīt′), *n.* ستالاکتایت
چلوورەیەکی کلسییە لە بنمیچ و بەرزاییەکانی ئەشکەوتەوە شۆڕدەبێتەوە.
**stalag** (stal′ag), *n.* ئۆردوگای زۆرەملێی ئەڵمانی بۆ دەستبەسەرانی جەنگ لە سەربازو ئەفسەریاران.
**stalagmite** (stə-lag′mīt, stal′əg-mīt′), *n.* ستالاگمایت
چلوورەیەکی کلسییە لە بنی ئەشکەوتدا پەیدادەبێت (هەندێك جار بە چلوورە کلسییە شۆڕبووەکان " ستالاکتایت " دەگات ).
**stale** (stāl), *adj.* (١) (ا) کۆن و بێ تام؛ کەف وکوڵ نەماو: *( ~ beer)* .
(ب) کۆن (نان)؛ کۆن و ڕەق: *( ~ bread)* .
(ج) پیس؛ ئۆکسجینی کەمە؛ وەستاو: *( ~ water or air)* .
(د) بۆ کۆنی لێ دێت؛ بۆگەن.
(٢) کۆن؛ سوواو؛ بێ تام؛ پەڕپووت: *( a ~ joke; ~ gossip)* .
(٣) لاواز؛ هێز پێ نەماو؛ بێ گڤ وگوڕ.
(٤) پەڕپووت یا لە کارکەوتوو بەهۆی کات زۆر بەسەردا تێپەڕبوونەوە:
*( a ~ debt)*
*v.t. & v.i.* کۆن بوون؛ بێ تام بوون؛ بۆ کۆن لێ هاتن؛ پەڕپووت بوون.
**stale** (stāl), *v.i.* میزکردن (ئەسپ و ڕەشەووڵاخ).
*n.* میز (ئەسپ و ڕەشەووڵاخ).
**stalemate** (stāl′māt′), *n.* (١) شا چەقین (شەترەنج)؛ یاری پێش " کش شا " . (٢) گیرخواردن (گفتوگۆ)؛ چەقین؛ وەستان؛ ڕێك نەکەوتنی دوو لا لە گفتوگۆداو گیرخواردنیان:
*( The negotiations have reached a ~ .)*
*v.t.* (١) گیرپێخواردنی شا (شەترەنج).
(٢) گیرپێخواردن (گفتوگۆ)؛ وەستاندن؛ ڕاوەستاندن.
**stalk** (stôk), *v.i.* (١) بە قنج وقیتی و بە فیزەوە ڕۆیشتن:
*( He ~ed out of the room in anger.)*
(٢) تەشەنەکردن؛ پێدا ڕۆیشتن یا بڵاوبوونەوە:
*( Famine ~ed through the land.)*
(٣) بەبێ خشپە شوێن کەوتن؛ بە دزییەوە دواکەوتن.
*v.t.* (١) بەبێ خشپە شوێن کەوتن (نێچیری ڕاو، دوژمن، سووسە)؛ بە دزییەوە دواکەوتن: *( to ~ a deer)* .
(٢) پێدا بڵاوبوونەوە؛ گرتنەوە: *( Terror ~ed the streets.)* .
*n.* (١) ڕۆیشتنی قنج وقیت و بەفیز.
(٢) بەبێ خشپە شوێن کەوتن (نێچیر، دوژمن، سووسە).
-stalker *(n.)*.
**stalk** (stôk), *n.* لاسك؛ لاسق؛ قنچك؛ قەف؛ دارك؛ قەد.
-stalky *(adj.)*.
**stalking-horse** (stôk′iŋ-hôrs), *n.* (١) ئەسپێکە یا شتێکە لە ئەسپ بچێ کە ڕاوچی خۆی لە پەنادا دەشارێتەوە.
(٢) بیانوو؛ بەڵگە؛ شتێکە مەبەستی ڕاستەقینەی پێ بشارێتەوە.
(٣) کەسێکی نامزەدکراوە لە هەڵبژاردنێکدا بۆ داپۆشینی کەسێکی گرنگتر یا بەش بەش کردنی ئەو دەنگانەی بەرامبەرەکەی وەری دەگرێت.
**stall** (stôl), *n.* (١) تەویلە؛ تاوڵە؛ گەوڕ.
(٢) خانەی ووڵاخێك لە تەویلەیەکدا. (٣) (ا) قەفەزەی سەردەمی بازاڕ؛ کانتێن.
(ب) تەختە یا کورسی پێشەوەی کڵێسە.
(ج) [British]، کورسی بەردەمی شانۆ.
(٤) کیفی پەنجە (لە لاستیك دروست دەکرێ بۆ پاراستنی پەنجە).
(٥) هێواش بوونەوەی فڕۆکەو کوژانەوەی بە ئاسمانەوە.
(٦) وێستگە یا مۆڵگەی ئۆتۆمبیلێك.
*v.t.* (١) کردنە تەویلەوە؛ دابەستن (بەران). (٢) چەقین (لە قوڕ یا بەفردا).
(٣) ڕاوەستاندن؛ وەستاندن. (٤) لەپڕ کوژانەوەو وەستانی مەکینەی فڕۆکە.
*v.i.* (١) کرانە تەویلەوە؛ لە تاوڵەدا بوون. (٢) چەقین (لە قوڕو بەفردا).
(٣) ڕاوەستان؛ وەستێنران؛ وەستان؛ چەقین.
(٤) کوتوپڕ کوژانەوەو وەستانی ئۆتۆمبیل؛ پەککەوتن؛ وەستان؛ چەقین:
*| The car (or engine) ~ed but I started it again. |*
(٥) وەستانی مەکینەی فڕۆکە لەبەر هێواش ڕۆیشتنی.
**stall** (stôl), *v.i.* بە فێڵ وتەڵەکە دواخستن یا وەستاندن؛ خۆ نەدان بە دەستەوە؛ بە دەمەوە گرتن.
*v.t.* ( ~ off ), بە فێڵ وتەڵەکە دواخستن یا ڕاگرتن؛ بە دەمەوە گرتن؛ ڕاگرتن بە خۆ لێ دزینەوە:
*( He could no longer ~ off his creditirs.)*
*n.* بە دەمەوە گرتن؛ فێڵ وتەڵەکەیەکە بۆ خۆدزینەوە لە ئەرکێکی ناخۆش یا دواخستن و ڕاگرتنی شتێکی ناخۆش.

**stall-fed** (stôl′fed´), *adj.* دابەستراو (بەران)؛ دابەستە.

**stall-feed** (stôl′fēd´), *v.t.* (١) دابەستن (بەران)؛ قەڵەوکردنەوە (٢) گزرە پێدان.

**stallion** (stal′yən), *n.* ئەسپی بەرین.

**stalwart** (stôl′wêrt), *adj.* (١) تێکسمراو؛ تۆکمە؛ بەهێز.
(٢) (أ) ئازا؛ قارەمان. (ب) پشت پێ بەستراو؛ یەك دڵ؛ چالاك؛ نەگۆڕ؛ لانەدەر؛ دوو دڵی نەکەر؛ یەك بار؛ بەبڕوا: *( a ~ supporter of freedom)* .

***n.*** (١) کەسێکی تێکسمراو یا تۆکمە؛ کەسێکی بەهێز.
(٢) لایەنگرێکی نەگۆڕ یا بەبڕواو دوودڵی نەکەر (بەتایبەتی هی حیزبێك یا مەسەلەیەکی رامیاری).

**stamen** (stā′mən), *n.* نێرەندامی گوڵ؛ نێرەك.

**stamina** (stam′ə-nə), *n.* بەرگەگرتن (مرۆڤ)؛ کێش؛ بەکێشی؛ تین؛ هێز.

**staminal** (stam′ə-nəl), *adj.* (١) بەکێش؛ بەتین؛ بەرگەگر.
(٢) نێرەکی؛ تایبەتی بە نێرەندامی گوڵ.

**staminate** (stam′ə-nit, stam′ə-nāt´), *adj.* (١) نێرەکیان پێوەیە بەڵام نێرکیان پێوە نییە (گوڵ)؛ هەر نێرەندامیان هەیە.
(٢) نێرەکدار؛ نێرەندامی هەیە.

**staminode** (stam′ə-nō´d), *n. Also* **staminodium.** نێرەندامی بێ بەر یا زڕ.

**stammel** (stam′'l), *n.* [Obs.]. (١) کالایەکی خوری زبری سوورە (بۆ جلی ژێرەوە). (٢) ڕەنگی سووری ئەم کالایە.

**stammer** (stam′ẽr), *v.t. & v.i.* لاڵ بوون؛ زمان گیران؛ زمان تێکەڵ‌وپێکەڵ بوون؛ زمان لاڵ بوون.

***n.*** لاڵی؛ زمان گیران؛ زمان گیری.

**-stammerer** *(n.)*; **stammeringly** *(adv.)*.

**stamp** (stamp), *v.t.* (١) بە قایم پێ پیانان؛ پێشێل کردن.
(٢) (أ) پێ دان بە زەویدا بە توند؛ زەوی کوتانەوە بە قاچ؛ پێ کوتان بە زەویدا بە قایم؛ تەپە لێ هەڵسان: *( He ~ the floor in anger.)* .
(ب) ( ~ out ) ، پێشێل کردن؛ پێ لەقەلێدان؛ هارین؛ کوژاندنەوە؛ پێ پیانان؛ پلیشاندنەوە: *( to ~ out a cigarette; to ~ out a revolt)* .
(٣) لەسەر هەڵکەندن (ناو، نیشانە):
*( He ~ his initials into the leather.)*
(٤) نیشانەلێدان.
(٥) وەك نەخش تێدا هەڵکەندران:
*( The incident was ~ in her memory.)*
(٦) مۆرکردن (بروانامە)؛ مۆرلێدان؛ دامغەلێدان؛ پوول لێدان؛ شەقڵ کردن.
(٧) [Dial.]، هارین (کانزای خاو).

***v.i.*** (١) پێ دان بە زەویدا بە قایم؛ زەوی کوتانەوە بە قاچ؛ پێ کوتان بە زەویدا.
(٢) بە تەپەتەپ ڕۆیشتن؛ تەپەی پێ هاتن.

***n.*** (١) پێ دان بە زەویدا؛ پێ کوتان بە زەویدا.
(٢) مەکینەی هارینی کانزای خاو. (٣) دارێژگە؛ قاڵب.
(٤) دارێژە؛ شتی لە قاڵب دراو یا بە قاڵب دروستکراو.
(٥) مۆر؛ دامغە؛ نیشتەمیا؛ شەقڵ.
(٦) (أ) پوول (هی میری یا بازرگانی): *( trading ~s )* .
(ب) پوولی پۆستە: *( postage ~ )* .
(٧) نیشانە؛ نیشانەی تایبەتی:
*( The book bears the ~ of its author's genius.)*
(٨) تایبەخۆ؛ چەشن؛ جۆر.

**stampede** (stam-pēd′), *n.* (١) پاڵەپەستۆیەکی لەپڕ بۆ ڕاکردن یا دەربازبوون (ڕەشەووڵاخ). (٢) پاڵەپەستۆی لەپڕ.

***v.t.*** لەپڕ کردن بە پاڵەپەستۆ بۆ دەربازبوون.

**stamper** (stam′pẽr), *n.* (١) بەتاتکەرەوەی پوولی پۆستە
(٢) شەقڵکەر؛ نیشانەکەر. (٣) دارێژ؛ لەقاڵبدەر.
(٤) مەکینەی بەردو کانزای خاو هارین یا ووردکردن

**stamping ground,** [Colloq.], هەوارگە؛ شوێنێکی پەسەندی یەککرتنی ئاسایی خەڵك یا گیاندار؛ مۆڵگە؛ شوێنێکە کە کەسێك حەزی لێ دەکات‌و هەمیشە بۆی دەچێ.

**stamp mill,** (١) کارگەی هارین یا ووردکردنی کانزای خاو.
(٢) مەکینەی هارین یا ووردکردنی کانزای خاو.

**stance** (stans), *n.* (١) شێوەی وەستانی مرۆڤ یا گیاندار (بەتایبەتی هی یاریکەر لەکاتی لە تۆپ دانا)؛ هەڵوێست.
(٢) هەڵوێست (بەرامبەر بە مەسەلەیەك):
*( What is his ~ on independence for minotrties?)*

**stanch** (stanch), *v.t.* (١) خوێن وەستاندن؛ بەرگرتن.
(٢) خوێنی برین وەستاندن؛ خوێن گرتنەوە؛ خوێن وەستاندنەوە.
(٣) [Archaic or Dial.]، کەمکردنەوە؛ کوژاندنەوە؛ شکاندن (تینوێتی).

***v.i.*** خوێن وەستان.

***adj.*** = staunch.

**stanchion** (stan′shən), *n.* (١) کۆڵەکە؛ دیرەك.
(٢) یەکێکە لەو شیشە ستوونییانەی مانگای پێ دەبەسترێتەوە لە گەوڕدا

***v.t.*** (١) کۆڵەکە دانەبەر. (٢) بەستنەوەی ووڵاخ بە شیشی ستوونییەوە.

**stand** (stand), *v.i.* (١) (أ) بە پێوە وەستان؛ وەستان؛ ڕاوەستان
(ب) باڵایەکی تایبەتی هەبوون بە پێوە: *( He ~s six feet.)*
(ج) هەڵسانە سەر پێ؛ بەرزبوونەوە. (د) ڕەپ بوون؛ هەڵسان (کێر)
(٢) بە جۆرێکی تایبەتی وەستان؛ لە شوێنێکی تایبەتیدا وەستان:
*( to ~ aside)*
(٣) هەڵوێستێکی تایبەتی هەبوون یا نواندن: *( to ~ fim on an issue )*
(٤) لە بارێك یا هەڵوێستێکی تایبەتیدا بوون: *( He ~s accused.)*
(٥) ڕێیەکی تایبەتی گرتن لە دەریادا.
(٦) [Obs.]، دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن.
(٧) لە پلەیەکی تایبەتیدا بوون: *( She ~s first in her class.)*
(٨) لە بارێکی تایبەتیدا بوون: *( He ~s to make quite a profit.)*
(٩) [British]، خۆ ئامزەدکردن یا پاڵاوتن (هەڵبژاردن).
(١٠) (أ) ڕاوەستان؛ لەسەر بنکە یا بن وەستان:
*( A clock ~ on the mantle.)*
(ب) لە شوێنێکی تایبەتیدا بوون: *( The house ~ on a hill.)*
(١١) (أ) نەبزوان؛ وەستان؛ جووڵە نەکردن:
*( The car ~ in the garage for a week.)*
(ب) پەنگخواردنەوە؛ وەستان؛ قەتیس بوون:
*( tears ~ing in her eyes)*
(١٢) وا بوون؛ گونجان؛ سازان: *( it ~s to reason )* .
(١٣) (أ) لە شێوەیەکی تایبەتیدا بوون:
*( to copy a passage exactly as it ~s)*
(ب) هێشتا هەر دروست بوون؛ هەر وەك خۆ مانەوەو نەگۆڕان
*( The law still ~s.; The order given last week still ~s.)*
(١٤) توانای پەڕین هەبوون (ئەسپ).

***v.t.*** (١) (أ) نەفەوتان؛ مانەوە؛ سەرکەوتوو بوون؛ دەربردن:
*( This book will ~ the test of time.)*
(ب) بەرگەگرتن؛ دەربردن؛ خۆڕاگرتن: *( He ~s pain well.)* .
(ج) حەز لە چارە کردن؛ لەگەڵدا دەربردن:
*( She can't ~ her boss.; I can't ~ that guy.)*
(د) لە توانادا بوون: *( He can ~ another drink.)* .
(هـ) ئارام گرتن.
(٢) بەرگەگرتن؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەرگری کردن: *( to ~ a siege )*
(٣) مل بۆ دان؛ پێ کران؛ نۆشین؛ بەسەرداهاتن: *( to ~ trial)*
(٤) پێ هەڵسان؛ کردن (پاسەوانی)؛ ئەرك بینین: *( to ~ guard)* .
(٥) وێرکردن؛ پارەدان.
(٦) وەستاندن لەسەر پێ؛ ڕاوەستاندن؛ ڕاستکردنەوە.

***n.*** (١) وەستان؛ ڕاوەستان؛ مانەوە لە شوێنێکدا.

(٢) (ا) وەستان و بەرەنگاربوون؛ وەستان بۆ بەرهەڵستی کردن. (ب) بەرهەڵستی.
(٣) جێی وەستان: *( He took his ~ at the rear.)* .
(٤) هەڵوێست؛ را؛ بیروڕا: *( I have made my ~ clear.)* .
(٥) (ا) بەرزەکی لەسەر وەستانی تەماشاکەرانی خۆپیشاندانێك؛
سەکۆی لەسەر وەستانی تیپی مۆسیقا: *( a reviewing ~ )*
(ب) تەلانی سەیرکەران لە یاریگادا.
(ج) سەیرکەرانی یارییەك.
(د) شوێنی وەستان یا دانیشتنی شایەت لە دادگادا. (ھ) دووانگە
(٦) (ا) وەستانی تیپی شانۆگەری گەڕۆك بۆ شانۆنامە پێشکەش کردن:
*( a one-night ~ )*
(ب) شاری تێدا راوەستانی تیپێکی گەڕۆکی وەها
(٧) سایەبار یا کوختەی دارینەی فرۆشگا؛ فرۆشگای بچووکی سەرەڕێ؛
کانتێن؛ قەفەزە دووکان: *( a newspaper ~ ; a vegetable ~ ; a hamburger ~ )*
(٨) وێستگەی ئوتومبیلی کرێ: *( a taxi ~ )* .
(٩) دۆلاب؛ چوارچێوەی شت تیا دانان؛ ڕیزە ڕەفە: *( a music ~ )* .
(١٠) ڕیزە درەخت یا ڕووەکی بەرز؛ پەڵە درەخت: *( a ~ of pine)* .
(١١) راوەستان؛ هەڵوێست؛ شێوەی وەستان؛ پۆز
(١٢) [Obs or Dial.]، دەستە؛ تاقم؛ پۆل.

**make a stand,** (١) هەڵوێستی بەرگری وەرگرتن؛ بەرگری کردن؛
بەرهەڵستی کردن. (٢) لایەنگری لایەك یا بیروڕایەك کردن؛
لایەنگیری خۆ نیشاندان. (٣) وەستان؛ ڕاوەستان.

**stand a chance,** سەرکەوتن بۆ هەبوون؛ ئومێدی سەرکەوتن لێ کران؛
ئومێدی بەرگەگرتن لێ کران.

**stand by,** (١) چاوەڕێ کردن بە ئامادەیی؛ ئامادەبوون؛ چاوەڕێ کردن.
(٢) پشت گرتن؛ لایەنگیری کردن؛ پاڵپشتی کردن؛ یارمەتیدان؛ پشت بەرنەدان:
*( to stand by someone in time of need)*
(٣) ڕاگرتن (بەڵێن)؛ نەشکاندن (بەڵێن): *( to stand by one's word)* .
(٤) خۆ تێ نەگەیان؛ تەماشاکردن و هیچ نەکردن؛ لەلاوە وەستان و هیچ نەکردن:
*( He stood by while a crime was being committed.)*

**stand down,** جێی خۆ نەجێهێشتن و چوونە ئەو لاوەی شایەت پاش
تەواوبوونی شایەتییەکەی.

**stand for,** (١) نیشانەی ئەوەبوون؛ واگەیاندن:
*( P.O. stands for post office.)*
(٢) پشتیوانی کردن؛ لایەنگری کردن: *( to stand for free trade)* .
(٣) [British]، خۆ ئامزەدکردن؛ خۆهەڵبژاردن بۆ:
*( to stand for parliament)*
(٤) [Colloq.]، ڕێگەدان؛ چاوپۆشی کردن؛ لێبووردن؛ دەربردن:
*( I can't stand for that kind of behavior.)*

**stand in for,** جێگرتنەوەی کەسێکی تر؛ لەباتی کەسێکی تر کارکردن؛
جێگری کردن:
*( The Vice President will stand in for the President.)*

**stand in,** (١) جێگری کردنی نوێنەری سینەما و شانۆ لەکاتی ئامادەکردنی
کەرەسەی وەك کامێرا و ڕووناکی و... هتد (٢) جێگری کردن

**stand in line,** لە ڕیزدا وەستان؛ نۆرەگرتن.

**stand off,** (١) خۆ دوور ڕاگرتن؛ لە دوورەوە وەستان؛ لێ دوورکەوتنەوە.
(٢) ڕوو پێ نەدان (٣) پەیڕەوی نەکردن.
(٤) خۆ لێ دەربازکردن؛ خۆنەدان بەدەستەوە.
(٥) دوور لە کەنار دەریاوە ڕۆیشتن (کەشتی).

**stand on,** (١) کەوتنە سەر ئەوە؛ لەسەر ئەوە ڕاوەستان.
(٢) سووربوون لەسەر؛ داواکردن؛ گوێ پێدان: *( to stand on ceremony)* .
(٣) لە ڕێ لا نەدان (کەشتی)؛ ڕێ نەگۆڕین.

**stand one's ground,** (١) جێی خۆ بەرنەدان یا جێ نەهێشتن (جەنگ)؛
بەرهەڵستی کردن؛ نەجووڵان؛ خۆنەدان بەدەستەوە؛ نەبەزین.
(٢) سووربوون لەسەر هەڵوێست و ڕای خۆ و کۆڵنەدان؛ نەبەزین.

**stand on one's own feet,** پشت بە خۆ بەستن (لە کار و
بیرکردنەوەیشدا)؛ سەربەخۆبوون؛ پێویست بە کەس نەبوون.

**stand out,** (١) دەرپۆقین؛ دەرپەڕین.
(٢) زۆر دیاربوون؛ زۆر لەبەرچاوبوون. (٣) بە توندی بەرهەڵستی کردن.

**stand over,** (١) دواخستن. (٢) چاودێری کردن بە وردی.

**stand to.** (١) ئیش کردن بەبێ وەستان. (٢) ئامادەبوون.
(٣) وازنەهێنان؛ دەست هەڵنەگرتن؛ کۆڵنەدان.
(٤) بەڵێن نەشکان؛ بەڵێن ڕاگرتن.

**stand up,** (١) هەڵسانە سەر پێ:
*( Everyone stood up when the King came in.)*
(٢) بەرگەگرتن؛ دەربردن؛ خۆڕاگرتن:
*( That statement does not stand up on examination.)*
(٣) [Slang]، نەچوون بۆ ژووانێك (بەتایبەتی بە دەستەنقەست):
*| She stood him up. |*

**stand up for,** لایەنگیری کردن؛ لەسەرکردنەوە؛ پشتگیری کردن.

**stand up to,** (١) لە ڕوودا وەستان؛ بەرەنگاربوون؛ بەرەو ڕوو وەستان
بەبێ ترس. (٢) بەرهەڵستی کردن؛ خۆڕاگرتن.

**take the stand,** گەواهی یا شایەتیدان؛ بەڵگە پێشکەش کردن لە
دادگادا (گومانبار، داواچی، شایەت):
*| The defendant ( witness, plaintiff ) will take the stand tomorrow. |*

**standard** (stan′dērd), ***n.*** (١) ئاڵا؛ بەیداخ؛ درووشم.
(٢) پێوانە؛ پێوەر؛ ئەندازە؛ تەرازوو؛ پێوانەی گشتی:
*( ~s of weight and measure are set by the government.)*
(٣) بنچینەی سکە: *( the gold ~ )* .
(٤) ئەندازەی زێڕ، زیو، یا کانزای تر لە پارەدا.
(٥) نموونە؛ وێنە؛ مۆدێل
(٦) پلە: *( the ~ of living)* .
(٧) کۆڵەکە؛ پایە؛ پاڵپشت؛ ستوونێکە بۆ شت خستنەسەر.
(٨) پەڕەی گەورەی گوڵ.
(٩) [British]، پلە (قوتابخانەی سەرەتایی)؛ پۆل.
(١٠) درەختی هەڵچوو بە ئاسماندا بێ ئەوەی داری بدرێتە بەر.

*adj.* (١) نموونەیی؛ وێنەیی؛ مۆدێل.
(٢) باش؛ چاك: *( ~ reference books)* .
(٣) (ا) ئاسایی؛ ناتایبەتی؛ باو: *( the ~ model of an automobile)* .
(ب) ئاسایی؛ باو؛ ناتایبەتی:
*( ~ procedures, measures, ingredients, etc.)*
(٤) پەتی (زمان)؛ هی وێژە و نووسین: *( ~ English; the ~ language)*
(٥) قەبارەی ئاسایییە (تیپی چاپەمەنی).

**standard-bearer** (stan′dērd-bâr′ēr), ***n.*** (١) ئاڵاهەڵگر؛ ئاڵادار؛
بەیداخ هەڵگر. (٢) پێشەوا (حیزب، ڕێکخراو، کۆمەڵە)؛ سەرۆك؛ ڕابەر:
*( the ~ of the Democratic Party in the next election)*

**standardization** (stan′dēr-dī-zā′shən), ***n.*** (١) پێوان؛ پێوانە.
(٢) بەیەککردنی گشت ئەندازەکان؛ بەیەك ئەندازە کردن.

**standardize** (stan′dēr-dīz′), ***v.t.*** (١) یەك ئەندازە کردن؛
بەیەککردنی هەموو ئەندازەکان؛ وەك یەك لێکردنی ئەندازەکان:
*( to ~ tests, textbooks, procedures, etc.)*
(٢) پێوان؛ ئەندازە گرتن.

**Standard English,** ئینگلیزی پەتی؛ ئینگلیزی وێژەیی و نووسین؛
زمانی ئینگلیزی بەکارهێنراو لەلایەن زۆربەی ڕۆشنبیرانەوە زۆربەی کات.

**standard language,** زمانی پەتی؛ زمانی وێژەیی و نووسین؛
زمانی بەکارهێنراو لەلایەن زۆربەی ڕۆشنبیرانەوە زۆربەی کات.

**standard of living,** پلەی ژیان.

**standard time,** کاتە زستانە؛ کاتی ڕەسمی وڵاتێك.

**stand-by** (stand′bī′), ***n.*** (١) کەسێکی پشت پێ بەستراو؛

لایەنگرێکی دڵسۆزو ئامادە. (٢) بریکار: شتێکی هەمیشە ئامادەیە بۆ بەکارهێنانی لە بریتی شتێکی تر؛ جێگری هەمیشە ئامادە.

**standee** (stan-dē′), *n.* کەسێکی بە پێوە وەستاو لەبەر بێ جێگەیی.

**stand-in** (stand′in′), *n.* (١) جێگری نوێنەری سینەماو شانۆ لەکاتی ئامادەکردنی کامێراو چراو شتی تردا. (٢) جێگر.

**standing** (stan′diŋ), *n.* (١) هەڵسانە سەر پێ؛ ڕاوەستان؛ وەستان؛ بە پێوە وەستان. (٢) جێی وەستان؛ وێستگە.
(٣) ناوبانگ؛ ناو؛ پلەوپایەو ڕێزو ناوی باش:
[ *a man ( lawyer, writer ) of high ~ ; to be in good ~* ]
(٤) ماوەی بوون؛ کۆنو تازەیی (نەریت، خوو، ناکۆکی، ئەندامێتی... هتد):
[ *a custom ( law, dispute, record ) of long ~* ]
*adj.* (١) (ا) بە پێوە وەستاو؛ بە پێوە ڕاوەستاو؛ لەسەر پێ:
*( the ~ audience)*
(ب) بە پێوە؛ نە بڕاوەتەوە: *( ~ corn, grain, timber, etc.)* .
(٢) بە پێوە کراو بەبێ گوڕ بەستنەوە: *( a ~ jump )* .
(٣) لەگەڕکەوتوو؛ کار پێ نەکراو؛ لەکارکەوتوو؛ کارنەکەر:
*( a ~ engine, factory, etc.)*
(٤) وەستاو (ئاو): *( ~ water)* .
(٥) (ا) هەمیشەیی؛ ناسەردەمی؛ بەردەوام:
*( a ~ invitation to dinner; a ~ army; a ~ offer)*
(ب) هێشتا هەر درووستەو کاری پێ دەکرێ: *( a ~ rule)* .
(ج) جێگیر؛ نەبزۆك؛ نەجووڵێنراو؛ نەبزووت.

**standing army,** سوپای هەمیشەیی؛ لەشکری هەمیشەیی نەك تەنها لەکاتی جەنگدا.

**standing committee,** لیژنەی هەمیشەیی (بەتایبەتی هی پەرلەمان).

**standing order,** (١) فەرمانی هەمیشەیی (سوپا).
(٢) (*pl.*)، پەیڕەوی هەمیشەیی (پەرلەمان).

**standing room,** جێی ڕاوەستان (پاش گیرانی هەموو کورسییەکان لە شانۆ، یاریگا، یا هۆی هاتوچۆدا... هتد).

**standish** (stan′dish), *n.* [Archaic], = **inkstand.**

**stand-off** (stand′ôf′), *n.* (١) خۆ دوور ڕاگرتن؛ خۆ لێ دوور ڕاگرتن؛ خۆ لێ دوور ڕاگیران (٢) پارسەنگ؛ هاوتاکەر.
(٣) بەرامبەری (پێشبڕکێ، یاری)؛ بەرامبەربوون؛ هاوتابوون.
*adj.* = **standoffish.**

**standoffish** (stand′ôf′ish), *adj.* دوورەپەرێز؛ ڕووپێنەدەر؛ گۆشەگیر؛ سارد؛ خۆ دوو ڕاگر.

**stand oil,** ڕۆن کەتانی داخ کراوو خەستکراوە (لە بۆیەدا بەکاردێت).

**stand-out** (stand′out′), *n.* (١) کەسێکی هەمیشە نەگونجاو لەگەڵ بڕیارو ڕای کۆمەڵدا؛ گێرەنەکەر. (٢) کەسێکی دەرکەوتووو لێهاتوو.

**stand-pat** (stand′pat′), *adj.* [Colloq.], کۆنەپەرست؛ نەگۆڕ؛ حەز بە گۆڕین نەکەر.

**stand-patter** (stand′pat′ēr), *n.* [Colloq.]. کەسێکی کۆنەپەرست؛ کەسێکی دژ بە گۆڕین.

**stand-point** (stand′point′), *n.* (١) جێی لێوە ڕوانین؛ شوێنی لێوە سەیرکردنی شتێك. (٢) هەڵوێست؛ ڕا؛ بیروڕا؛ ڕوو (ئەڵێن: لەم ڕووەوە)؛ شێوەی تێڕوانینو هەڵسەنگاندن.

**stand-still** (stand′stil′), *n.* چەقین؛ وەستان؛ گیرخواردن:
*( to come to a ~ )*

**stand-up** (stand′up′), *adj.* (١) ڕاوەستاو؛ بە پێوە وەستاو
(٢) ڕەق وەستاو (ملیوان)؛ نە نوشتانەوە: *( a ~ collar)* .
(٣) بە پێوە کراو؛ بەسەر پێوە:
*( a ~ meal, drink, etc. ; a ~ comedian)*

**stang** (staŋ), *archaic past tense and p.p. of* **sting.**

**stanhope** (stan′hōp, stan′əp), *n.* گالیسکەیەکی سووکی سەرکراوەی یەك کورسی دوو یا چوار پێچکەییە.

**stank** (staŋk), *alternative past tense of* **stink.**

**stannary** (stan′ēr-i), *n.* [British], کانە تەنەکە؛ کارگەی تەنەکە پوختەکردن.

**stannum** (stan′əm), *n.* تەنەکە (کانزا)؛ قەڵایی.

**stanza** (stan′zə), *n.* بڕگەی هۆنراوە (هەندێك جار چوارخشتەکییەو هەندێك جار زیاتر)؛ بڕگەی هەڵبەست.

**stapelia** (stə-pē′li-ə), *n.* ڕووەکێکی گوڵ ئەستێرەیی زەرد یا ئەرخەوانی بۆگەنە.

**stapes** (stā′pēz), *n.* ئێسکە ئاوزەنگی: یەکێکە لە سێ ئێسکی بچووکی گوێی ناوەڕاستی گیانداری شیردەر. (هەروەها " **stirrup bone** ").

**staphylo-** (staf′i-lō, staf′i-lə), *Also* **staphyl,** (١) پێشگرێکە بەمانای: (ا) زمانە بچکۆلە. (ب) هێشوویی.

**staphylococcus** (staf′i-lə-kok′əs), *n.* میکرۆبێکی هێشووییە (دەبێتە هۆی کێم درووستبوون لە دوومەڵدا).

**staphyloplasty** (staf′i-lə-plas′ti), *n.* نەشتەرگەری زمانە بچکۆلەو مەڵاشوو.

**staple** (stā′p'l), *n.* (١) بەرهەم یا فرۆتەنی سەرەکی ناوچەیەك یا وڵاتێك. (٢) کەرەسەی سەرەکی شتێك؛ ماددەی پێکهێنەری سەرەکی شتێك.
*( Politics is the ~ of his conversation.)*
(٣) کەرەسەی خاو.
(٤) فرۆتەنی یا خواردەمەنی هەمیشە پێویستو بەکارهێنراو؛ فرۆتەنی سەرەکی: *( Flour, sugar, and salt are ~s .)* .
(٥) (ا) ڕیشاڵی لۆکەو کەتانو خوری (لە ڕووی درێژیو چاکییەوە).
(ب) درێژیو نمرەی چاکی تایبەتی ڕیشاڵێکی وەها.
(٦) [Archaic]، بازاڕی سەرەکی.
*adj.* (١) هەمیشە پێویستو بەکارهێنراو (فرۆتەنی، خواردەمەنی):
*( Rice, wheat, and sugar are ~ foods.)*
(٢) سەرەکی (بەرهەم، فرۆتەنی):
*( Coffee is the ~ product of Brazil.)*
(٣) سەرەکی؛ گرنگترین؛ ئاسایی: *( ~ topics of gossip)* .
*v.t.* جیاکردنەوەی لۆکەو کەتان بەپێی درێژیو چاکی ڕیشاڵەکانی.

**staple** (stā′p'l), *n.* (١) دەرزییەکی دوو سەرەیە بۆ شت پێ دان لە دیوارو ڕووی تر. (٢) دەرزییەکی وەهایە بۆ کتێبو دەفتەر لێکدان؛ دەرزی کتێب.
*v.t.* لێکدان بە دەرزی وەها؛ لە دیواردان بە دەرزی وەها:
*( to ~ papers together)*

**stapler** (stā′plēr), *n.* (١) فرۆشیار یا دەڵاڵی فرۆتەنیو خواردەمەنی هەمیشە پێویستو بەکارهێنراو (٢) خوریو لۆکەو کەتان جیاکەرەوە.

**stapler** (stā′plēr), *n.* مەکینەی دەرزی (بۆ پەڕەو کاغەز لێکدان)؛ دەرزی دان.

**star** (stär), *n.* (١) ئەستێرە؛ هەسارە. (٢) شێوەی ئەستێرە.
(٣) نیشانە، درووشم، یا شێوەیەکی ئەستێرەیی.
(٤) نیشانەیەکی بچکۆلەی ئەستێرەیییە لە پەراوێزی کتێبدا بەکار دەهێنرێت؛ ئەستێرۆچکە. (هەروەها " **asterisk** ").
(٥) ئەستێرەی گەڕۆك.
(٦) (ا) کەلوو (ئەستێرەناسی، بەتایبەتی لەڕووی کارکردنە سەر بەختی مرۆڤەوە)؛ برج؛ کۆ ئەستێرە. (ب) (*pl.*)، چارەنووس؛ بەخت.
(٧) کەسێکی لێهاتووو ناودار لە پیشەیەکدا (بەتایبەتی وەرزش):
*( a basketball ~ )*
(٨) نوێنەری سەرەکی فیلمێکی سینەما؛ نوێنەرێکی بەناوبانگی سینەمایی بەتایبەتی کە دەوری قارەمانی ببینێ لە فیلمێکدا.
*v.t.* (١) بە ئەستێرە ڕازاندنەوە؛ نیشانەکردن بە ئەستێرە.
(٢) نمرە بۆ دانانی شتێك بە ئەستێرە؛ هەڵسەنگاندنی شتێك بە ئەستێرە بۆ دانان. (٣) ئەستێرۆچکە لەسەردانان (پەراوێزی کتێب).
(٤) پێشکەش کردنی نوێنەرێکی سینەمایی لە دەوری قارەمانیدا.

*v.i.* (١) زۆر بە جوانی کردن؛ بە لێهاتووانە پێ هەڵسان؛ درەوشانەوە (مەجان)؛ زۆر بەباشی خۆنواندن. (٢) دەوری قارەمانی بینین لە فیلمێک یا شانۆنامەیەکدا.
*adj.* (١) زۆر دەرکەوتوو یا لێهاتوو؛ زۆر باش و سەرکەوتوو:
*( a ~ performer)*
(٢) ئەستێرەیی.

**starboard** (stär′bĕrd, stär′bôrd′, stär′bōrd′), *n.* لای ڕاستی کەشتی و فڕۆکە (ئەگەر لە دواوە بوەستیت و سەیری پێشەوە بکەیت).
*adj.* لای ڕاست؛ دەستە ڕاست.
*adv.* بە لای ڕاستدا؛ بە دەستە ڕاستدا.
*v.t. & v.i.* وەرچەرخان بەلای ڕاستدا (دەستاژووی کەشتی)؛ بادان یا وەرگەڕان بە دەستە ڕاستدا.

**starch** (stärch), *n.* (١) نیشاستە.
(٢) (*pl.*) خواردەمەنی نیشاستەیی.
(٣) ڕەووشتی ڕەق؛ ڕەفتاری ووشک و بەفیز؛ سەرسەختی؛ کەللەڕەقی.
(٤) [Colloq.] تین؛ ووزە؛ گڤ و گوڕ؛ چوست و چالاکی.
*v.t.* ڕەق کردن بە نیشاستە (ملیوانی کراس)؛ نیشاستە لێدان.

**starchy** (stär′chi), *adj.* (١) نیشاستەیی (خواردەمەنی)؛ نیشاستەی تێدابە: *( ~ foods)* .
(٢) بە نیشاستە ڕەق کراو (ملیوانی کراس).
(٣) ڕەق (ڕەفتار)؛ ووشک و بەفیز؛ کەللەڕەق؛ ووشک.
-starchiness *(n.)*.

**star-crossed** (stär-krôs′t), *adj.* چارە ڕەش؛ نەگبەت؛ ئەستێرەکوژ (ئەستێرەوانی): *( A pair of ~ lovers take their life.)* .

**stardom** (stär′dəm), *n.* (١) پلەوپایەی نوێنەری سینەمای بەرز؛ نوێنەرێتی بەرزی سینەما:
*( The young actress finally attained ~ .)*
(٢) گشت نوێنەرانی بەرزی سینەما.

**star dust,** (١) تۆزەستێرە؛ کۆمەڵە ئەستێرەی زۆر دوورو بە چاو نەبینراو بە جیا جیا. (٢) جوانی دڵفڕێن و شەیداکەر؛ هەستی دڵداری و شەیدایی؛ مەستێتی (مەجان).

**stare** (stâr), *v.i.* (١) (ا) چاو تێ بڕین. (ب) چاوزەقکردنەوە؛ مۆربوونەوە؛ زەق زەق تەماشاکردن. (٢) زۆر دیاربوون؛ زۆر دەرکەوتن یا لەبەرچاوبوون؛ زەق زەق دیاربوون. (٣) ڕاوەستان (قژ).
*v.t.* (١) زەق زەق تەماشاکردن؛ چاو تێ بڕین.
(٢) کارتێکردن بە زەق زەق تەماشاکردن:
*( We ~d her into confusion.)*
*n.* (١) چاو تێ بڕین؛ چاو تێ بڕینێک.
(٢) چاوزەقکردنەوە؛ مۆربوونەوە؛ زەق زەق سەیرکردن.
**stare down,** چاو پێ شۆڕکردن (بە خێسەلێکردن)؛ چاوشکاندن؛ بۆرپێدان بە چاو تێ بڕین.
**stare one in the face,** (١) ڕووبەڕوو سەیرکردن؛ ڕووبەڕوو وەستان و سەیرکردن؛ چاو بڕینە چاو. (٢) بەبەر چاوەوە بوون؛ لەبەرچاوبوون؛ خۆ بۆ لێ نەشارانەوە.

**starets** (stâr′its), *n.pl.* ڕابەری ئاینی (کلێسەی ڕۆژهەڵاتی)

**star-fish** (stär′fish′), *n.* ئەستێرە ماسی.

**star-flower** (stär′flou′ĕr), *n.* گوڵە ئەستێرەیی؛ ڕووەکێکە گوڵی پێنج پەڕەیی وەک ئەستێرە دەگرێ.

**stargaze** (stär′gāz′), *v.i.* (١) چاو بڕینە ئەستێرە؛ تەماشای ئەستێرە کردن (ئەستێرەوانی) (٢) daydream

**stargazer** (stär′gāz′ĕr), *n.* (١) چاوبڕە ئەستێرە، بەتایبەتی: (ا) ئەستێرەوان؛ ئەستێرەناس (ب) ئاسمانناس؛ گەردووناس.
(٢) جۆرە ماسییەکە چاوی لە تەوقی سەریایەتی.

**stargazing** (stär′gāz′iŋ), *n.* (١) چاوبڕینە ئەستێرە؛ تێڕوانینی ئەستێرە (٢) خەیاڵ پلاوی؛ داڵغەچێتی؛ زەرخەو بینین.

**star grass,** گیا ئەستێرە: چەند جۆرە گژوگیایەکن گوڵی ئەستێرەیی دەگرن.

**stark** (stärk), *adj.* (١) ڕەق (وەک لاشەی مردوو).
(٢) دیار؛ زۆر لەبەرچاو: *( a tree ~ in the snow)* .
(٣) (ا) چۆڵ و هۆڵ؛ دڵتەنگکەر؛ چۆڵ؛ چۆڵەوانی؛ ڕووتەنی.
(ب) ڕەق و تەق؛ ڕووت و قووت (ژوور): *( a ~ white room)* .
(٤) stark-naked .
(٥) تەواو؛ بێ کەم و زیاد: *( ~ madness, terror, nonsense, etc.)* .
(٦) توندوتیژ؛ سەخت؛ ناخۆش: *( the ~ realities of life)* .
(٧) [Archaic]، بەهێز؛ بەتین.
*adv.* (١) بە توندوتیژی؛ بە توندەوە؛ بە هەموو هێزێکەوە.
(٢) بەتەواوی؛ بەبێ کەم و زیاد: *( ~ mad; ~ naked )* .

**stark-naked** (stärk′nāk′id), *adj.* ڕووت و قووت.

**starless** (stär′lis), *adj.* بێ ئەستێرە؛ تاریک و نووتەک:
*(a ~ night)*

**starlet** (stär′lit), *n.* (١) ئەستێرۆچکە؛ ئەستێرە بچکۆلە.
(٢) [Colloq.]، کچە نوێنەرێکی سینەماییە کە ئامادە دەکرێ بۆ بینینی دەوری قارەمانی.

**starlight** (stär′līt′), *n.* شەوقی ئەستێرە.
*adj.* (١) شەوق ئەستێرەیی. (٢) بە شەوقی ئەستێرە ڕووناک بووەتەوە.

**starlike** (stär′līk′), *adj.* (١) ڕووناکە وەک ئەستێرە؛ شەوقدارە وەک ئەستێرە. (٢) شێوە ئەستێرەیی.

**starling** (stär′liŋ), *n.* ڕێشۆڵە.

**starlit** (stär′lit′), *adj.* بە شەوقی ئەستێرە ڕووناک بۆتەوە

**star-of-Bethlehem** (stär′əv-beth′li-əm), *n.* ڕووەکێکە لە توخمی شلێر.

**Star of David,** ئەستێرەی داود: دروشمی جوولەکەیە.

**starred** (stärd), *adj.* (١) بە ئەستێرە نەخشێنراو یا ڕازێنراوە.
(٢) ئەستێرە کاری تێکردووە (ئەستێرەوانی).
(٣) وەک نوێنەری سینەمایی پێشکەش کراو یا پێ ناسراو.

**starry** (stär′i), *adj.* (١) بە ئەستێرە نەخشێنراو یا ڕازێنراوە.
(٢) گەش؛ بریقەدار؛ درەوشاوە: *( ~ eyes)* .
(٣) شێوە ئەستێرەیی؛ ئەستێرەیی.
(٤) ئەستێراوی؛ پڕ لە ئەستێرە؛ ئەستێرەدار: *( a ~ night)* .
(٥) تایبەتی بە ئەستێرە؛ ئەستێرەیی.
-starriness *(n.)*.

**starry-eyed** (stär′i-īd′), *adj.* خەیاڵ پەرست؛ خەیاڵ خاو؛ خەیاڵ پلاو؛ ساویلکە.

**Stars and Bars,** ئاڵای بە ئەستێرەو میل نەخشێنراو؛ ئاڵای وولاتەکانی لای خوارووی ئەمەریکا بوو کە لە شەڕی براکوژیدا جیابوونەوە لە ئەمەریکا.

**Stars and Stripes,** ئاڵای بە ئەستێرەو میل نەخشێنراو: ئاڵای ئەمەریکا.

**star saphire,** یاقووتی شینی ئەستێرەیی.

**star shell,** بۆمبای ئەستێرەیی: بۆمبایەکە لە ئاسماندا دەتەقێتەوە بە گەشی بۆ ڕووناک کردنەوەی سەنگەری دوژمن.

**star-spangled** (stär′spaŋ′g′ld), *adj.* بە ئەستێرە نەخشێنراو یا ڕازێنراوە.

**Star-Spangled Banner,** (١) ئاڵای بە ئەستێرە نەخشێنراو: ئاڵای ئەمەریکا (هەروەها " stars and stripes ").
(٢) سروودی نیشتمانی ئەمەریکا.

**start** (stärt), *v.i.* (١) ڕاچڵەکین؛ داچڵەکین؛ هەڵسلەمینەوە؛ ڕاچەنین؛ هەڵبەزینەوە؛ ڕاپەڕین. (٢) ترازان؛ شلۆق بوون.
(٣) دەرپۆقین؛ دەرپەڕین
(٤) دەستپێکردن؛ کەوتنەڕێ: *( We ~ed at six o'clock.)*
(٥) کەرتنەکار؛ کەوتنە جم و جووڵ.

(٦) دەستپێکردن؛ پەیدابوون: *(How did the war ~?)* .

***v.t.*** (١) ڕاچڵەکاندن؛ داچڵەکاندن؛ هەڵساندن (ڕاو)؛ ڕاپەڕاندن:

*(We ~ed three birds at one time.)*

(٢) ترازاندن؛ شلوق کردن؛ جووڵاندن.

(٣) خستنەگەڕ (ئوتومبیل، مەکینە)؛ خستنەکار؛ خستنە ئیش:

*(to ~ a car, an engine, etc.)*

(٤) هێنانەکایەوە (باس)؛ هێنانە پێشەوە.

(٥) کردنەوە (بەلوعە، بۆری).

(٦) دەستپێکردن *(We ~ed work early this morning.)* .

(٧) نیشانەی دەستپێکردن دان (پێشبڕکێ): *(to ~ runners in a race)* .

(٨) (ا) دانان؛ دامەزراندن؛ کردنەوە (قوتابخانە)؛ بەردی بناغە دانان؛

دروستکردن: *(to ~ a school, movement, an organization)* .

(ب) کردنەوە (ئاگر)؛ داگیرساندن: *(to ~ a fire, fight, war, etc.)* .

(٩) خستنەسەر ئیش؛ دامەزراندن:

*(to ~ a person in life, business, etc.)*

***n.*** (١) ڕاچڵەکین؛ ڕاپەڕین؛ هەڵسلەمینەوە؛ ڕاتەکان.

(٢) جموجوڵی لەپڕو کەم خایەن: *(by fits and ~s)* .

(٣) پارچەی ترازاو؛ ترازان.

(٤) (ا) دەستپێکردن.

(ب) سەرەتا؛ نوک؛ بنەڕەت؛ جێ یا کاتی دەستپێکردن: *(from the ~)* .

(٥) نیشانەی دەستپێکردنی پێشبڕکێ.

(٦) هەلی دەستپێکردن.

**start out,** (١) کەوتنەڕێ؛ دەستپێکردن (گەشت).

(٢) دەستپێکردن (کار، پرۆژە، پیشە، نەریت... هتد).

**start up,** (١) ڕاچڵەکین؛ داچڵەکین؛ هەڵسلەمینەوە؛ ڕاپەڕین.

(٢) لەپڕ دەرکەوتن یا قوت بوونەوە؛ لەپڕ پەیدابوون یا سەردەرهێنان.

(٣) خستنەگەڕ؛ خستنەکار: *(to start up a motor, car, etc.)* .

**starter** (stär′tẽr), ***n.*** (١) دەستپێکەر (٢) بەشداری پێشبڕکێ.

(٣) ئەو کەسەیە نیشانەی دەستپێکردنی پێشبڕکێ دەدات.

(٤) ئامێری مەکینە خستنەگەڕ؛ ئامێری خۆ خستنەگەڕ.

(٥) کارگێڕی خستنە ڕێی پاس و فڕۆکە... هتد. (٦) هەوێن.

**star thistle,** جۆرێکە لە کەرتەشی.

**starting post,** جێی غارغارێن دەستپێکردن؛ سەرەتای غارغارێن.

**startle** (stär′t'l), ***v.t.*** (١) ڕاچڵەکاندن؛ هەڵسلەماندنەوە؛ ڕاپەڕاندن؛ داچڵەکاندن (٢) دڵ داخورپاندن؛ سەرسوڕماندن؛ پەشۆکاندن؛ سەرسام کردن

***v.i.*** (١) ڕاچڵەکان؛ هەڵسلەمینەوە؛ سڵکردنەوە؛ ڕاچەنین

(٢) دڵ داخورپان؛ سەرسوڕمان؛ سەرسام مان.

***n.*** (١) (ا) ڕاچەکین؛ هەڵسلەمینەوە؛ سڵکردنەوە.

(ب) دڵ داخورپان؛ دڵەخورپێ؛ خورپە. (٢) شتی ڕاچڵەکێن یا داخورپێن.

**startling** (stär′tliŋ), ***adj.*** دڵ داخورپێن؛ سەرسوڕمێنەر:

*(~ news; a ~ revelation)*

**starvation** (stär-vā′shən), ***n.*** (١) برسێتی؛ لە برسا مردن.

(٢) لە برسا مراندن.

**starve** (stärv), ***v.i.*** (١) لە برسا مردن

(٢) بێ بەش بوون؛ زۆر پێویستی پێ بوون.

(٣) [Colloq.]، زۆر برسی بوون؛ برسی بوون.

(٤) [Archaic]، لە سەرمادا مردن؛ زۆر سەرمابوون.

***v.t.*** (١) لە برسا مراندن.

(٢) برسی کردن و زۆر بۆ هێنان یا بەزۆر پێ کردن:

*(They ~d the city into submission.)*

**starve for,** بۆ برسی بوون؛ بۆ پەرێشان بوون؛ زۆر پێویستی پێ بوون:

*(He is starving for affection.)*

**straveling** (sträv′liŋ), ***adj.*** (١) برسی (٢) هەژار (٣) گەنگ؛ کەم

***n.*** کەسێک یا گیاندارێکی برسی؛ کەسێک یا گیاندارێکی لە برسا لاوازو پووکاوە.

**stash** (stash), ***v.t. & v.i.*** شاردنەوە بۆ ڕۆژی تەنگانە؛ هەڵگرتن؛

خستنەلاوە: *(to ~ away some money, food, etc.)* .

***n.*** شتی شاراوەی بەنرخ (پارە، خواردەمەنی... هتد).

**stasis** (stā′sis, stas′is), ***n.*** (١) (ا) وەستانی خوێن؛ خوێن ڕاوەستان.

(ب) ڕیخۆڵە گیران؛ قەبزی. (٢) نەبزوان؛ جووڵە نەکردن؛ نەجووڵان؛ لەنگەرگرتن

**-stasis** (stā′sis, stas′is), پاشگرێکە بەمانای: (ا) وەستان.

(ب) لەنگەر گرتن؛ نەبزوان

**-stat** (stat), پاشگرێکە بەمانای: ڕاگیرکەر (لە پلەیەکی تایبەتیدا):

*(thermostat)*

**state** (stāt), ***n.*** (١) بارودۆخ؛ چۆنێتی:

*(His affairs are in a bad ~.)*

(٢) بارودۆخێکی هەستی تایبەتی: *(a ~ of melancholy)* .

(٣) [Obs. or Rare]، (ا) پلەوپایەی کۆمەڵایەتی.

(ب) پلەوپایەی بەرز؛ بەرزی؛ گەورەیی.

(٤) گەزافی سامانداریتی؛ جۆری ژیانی دەوڵەمەندان؛ کەش‌وفش‌و سامانی خۆ نیشاندان؛ شکۆ. (٥) [S-]، پەرلەمانی هەندێ وولات.

(٦) [S-]، وولات (٧) [S-]، میری؛ فەرمانڕەوایی؛ دەوڵەت.

(٨) [S-]، یەکێک لە وولاتەکانی ئەمەریکا.

(٩) کاروباری میری بەرز. *(matters of ~)*

***v.t.*** ووتن؛ ڕوونکردنەوە؛ دەربڕین

*(She ~ the facts. He ~ his views.)*

**lie in state,** خستنەڕووی لاشەی کەسێکی گەورە بۆ بینینی لەلایەن گەلەوە پێش ناشتنی.

**the States,** [Colloq.], = **The United States.**

**State attorney, State's attorney,** پارێزەری گشتی میری (دادگەری).

**state capitalism,** ڕژێمی سەرمایەداری دەوڵەت.

**State college,** دانشگای میری؛ کۆلیجی میری.

**state-craft** (stāt′kraft´, stāt′kräft´), ***n.*** بەڕێوەبردنی کاروباری میری.

**stated** (stāt′id), ***adj.*** (١) دیاریکراو؛ ناوبراو؛ بڕیار لەسەردراو.

(٢) ووتراو؛ ڕوونکراوە؛ دەربڕاو؛ ئاشکراکراو.

**State flower,** دروشمی گوڵی یەکێک لە وولاتەکانی ئەمەریکا؛ گوڵی ویلایەت.

**statehood** (stāt′hood), ***n.*** بوون بە یەکێک لە وولاتەکانی ئەمەریکا.

**State-house** (stāt′hous´), ***n.*** بارەگای پەرلەمانی یەکێک لە وولاتەکانی ئەمەریکا.

**stateless** (stāt′lis), ***adj.*** بێ وولات؛ ئاوارە: *(a ~ person)* .

**stately** (stāt′li), ***adj.*** (١) بەشکۆ؛ شۆخ؛ جوان‌و گەورەو خۆش:

*(a ~ mansion)*

(٢) لەسەرخۆو سەلارانە؛ هێواش‌و بەشکۆوە: *(a ~ pace)* .

**-stateliness** ***(n.).***

**statement** (stāt′mənt), ***n.*** (١) ووتن؛ دەربڕین؛ ڕوونکردنەوە.

(٢) ووتە؛ ووتار؛ گوفتار؛ قسە؛ بڵاونامە؛ فەرموودە؛ ڕاگەیاندن.

(٣) ڕاپۆرتی حسابی بانق، قەرز، یا بیمە.

**state of the art,** دوا پلەی پێشکەوتنی ڕشتەیەک یا زانیارییەک لە سەردەمێکی تایبەتیدا.

**state of war,** لە جەنگدا بوون؛ باری جەنگ

**state-room** (stāt′rōōm´, stāt′room´), ***n.*** ژووری نووستنی تایبەتی لە شەمەندەفەرێک یا کەشتییەکدا.

**State's attorney,** = **State attorney.**

**state's evidence,** بەڵگە یا شایەتی میری دژی تاوانکارێک (هەندێک جار لەلایەن هاوتاوانێکی خۆیەوە) (دادگەری).

**turn state's evidence,** شایەتیدان بۆ میری دژی تاوانکارێک (گەلێک جار لەلایەن هاوتاوانێکییەوە) (دادگەری)

**statesman** (stāts′mən), ***n.*** کاربەدەستی بەرزی لێهاتووی میری

**-statesmanly** *(adj.).*

**statesmanlike** (stāts′mən-līk′), *adj.* (١) بۆ کاربەدەستی بەرزی میری شیاو؛ تایبەتی بە کاربەدەستێکی وەها. (٢) وەك کاربەدەستی بەرزی میری.

**statesmanship** (stāts′mən-ship′), *n.* لێهاتوویی لە چارەسەرکردنی کاروباری گرنگی میریدا؛ توانا و کارامەیی کاربەدەستی بەرزی میری.

**state socialism,** سۆشیالیزمی دەوڵەت: دەستبەسەرداگرتن و بەڕێوەبردنی گشت هۆی بەرهەمهێنان لەلایەن میرییەوە.

**State university,** زانکۆی میری

**state-wide** (stāt′wīd′), *adj.* لە سەرتاپای وڵاتێکی ئەمەریکادا.

**static** (stat′ik), *adj.* (١) وەستاو؛ نەجووڵاو؛ نەبزووت؛ لەنگەرگرتوو؛ جێگیر. (٢) (ا) نەگۆڕ (ب) مردوو (مەجاز).
(٣) هی تەزووی کارەبای وەستاو.
(٤) هی خشەخش یا وزەووزی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن.

*n.* خشەخش (ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)؛ وزەوز.

**statics** (stat′iks), *n.pl.* زانیاری لێکۆڵینەوەی تەنە وەستاوەکان

**station** (stā′shən), *n.* (١) ئێستگە؛ وێستگە؛ جێی وەستان.
(٢) وێستگەی پاسەوان.
(٣) فەرمانگە؛ - خانە؛ مەڵبەند: *( a police ~ ; a fire ~ ; a postal ~ )*
(٤) وێستگە: *( a bus ~ ; a railway ~ )*
(٥) بنکەی هێزی دەریایی؛ بنکەی سوپایی: *( a naval ~ )* .
(٦) ئێستگە (ڕادیۆ و تەلەفزیۆن): *( a radio ~ ; a television ~ )* .
(٧) پلەوپایەی کۆمەڵایەتی *( He married below his ~ .)* .
(٨) پەروەردگەی مەڕ و ڕەشەوڵاخ (لە ئوستورالیا)
(٩) [Archaic]. جێگیری؛ نەبزووتن.

*v.t.* دانان لە شوێنێکدا (بۆ کارکردن)؛ جێی کار بۆ دیاریکردن: *( When he was in the military, he was ~ in Germany.)*

**stationary** (stā′shən-er′i), *adj.* (١) جێگیر؛ نەبزۆك؛ نەبزووت؛ نەجووڵاو (٢) نەگۆڕ (نرخ، بار، دۆخ)؛ کەم و زیاد نەکەر؛ هەر وەك خۆ ماوە.
(٣) نیشتەجێ؛ کۆچ نەکەر؛ نیشتەنی.

*n.* کەسێك یا شتێکی جێگیر یا نەبزۆك

**stationary engine,** مەکینەی مەڵمی جێگیر.

**stationary engineer,** ئەندازیاری مەکینەی مەڵمی جێگیر.

**station break,** پشووی ئێستگە پشوویەك یا وەستانێکی کورتی بەرنامەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنە بۆ بڵاوکردنەوەی ناوی ئێستگەکە؛ بڵاونامەی بازرگانی و هی تری بڵاوکراوە لە کاتی ئەم پشووەدا.

**stationer** (stā′shən-ĕr), *n.* (١) کتێب فرۆش؛ کتێب بڵاوکەرەوە یا چاپکەر. (٢) کەرەسەی نووسین فرۆش.

**stationery** (stā′shən-er′i), *n.* (١) کەرەسەی نووسین؛ پێویستی نامە نووسین. (٢) فرۆشگای کەرەسەی نووسین؛ فرۆشگای پێویستی نامە نووسین و قوتابخانە.

**station house,** ئێستگەخانە: پۆلیسخانە؛ ئێستگەی ئاگر کوژاندنەوە.

**station-master** (stā′shən-mas′tĕr), *n.* کارگێڕی ئێسگەی شەمەندەفەر

**station wagon,** ئوتومبیلی ستێشن.

**statistic** (stə-tis′tik), *adj.* ژمێرەیی؛ تایبەتی بە ژمێرەکاری.

*n.* (١) یەك دانە یا ماددەی ژمێرە. (٢) ژمێرەناسی؛ ژمێرەکاری.

**-statistical** *(adj.)*; **statistically** *(adv.).*

**statistician** (stat′is-tish′ən), *n.* ژمێرەناسی؛ ژمێرەناس؛ زانای ژمارەکاری.

**statistics** (stə-tis′tiks), *n.pl.* (١) ژمێرەناسی؛ زانستی ژمێرە.
(٢) ژمێرەکاری؛ ژمێرە

**statocyst** (stat′ə-sist′), *n.* توورەکەی لەنگەر یا هارتایی (لە گیانەوەری بێ بڕبڕەدا).

**stator** (stā′tĕr), *n.* بەشی جێگیری مەکینە کە بەشێکی تری مەکینەکەی تێدا یا بە دەوردا دەخولێتەوە.

**statoscope** (stat′ə-skōp′), *n.* (١) پەستانپێوی ووشك؛ بارۆمەتری کانزایی. (٢) پەستانپێوی ووشکی بەرزی پێوەری فڕۆکە.

**statuary** (stach′ōō-er′i), *n.* (١) پەیکەر بە گشتی؛ پەیکەر گەل.
(٢) پەیکەرکاری؛ پەیکەرگەری؛ پەیکەر دروستکردن.
(٣) پەیکەرتاش؛ پەیکەرکار.

*adj.* پەیکەری؛ بۆ پەیکەر شیاو؛ تایبەتی بە پەیکەر.

**statue** (stach′ōō, stach′oo), *n.* پەیکەر.

**Statue of Liberty,** پەیکەری ئازادی (لە نیویۆرك).

**statuesque** (stach′ōō-esk′), *adj.* پەیکەری؛ لە شۆخ و شەنگی و جوانی و ڕێكوپێکیدا لە پەیکەر دەچێت: *( a ~ figure, body, etc.)* .

**statuette** (stach′ōō-et′), *n.* پەیکەرە چکۆلە.

**stature** (stach′ĕr), *n.* (١) بالا؛ قەدوبالا؛ قەڵافەت.
(٢) پلەوپایە؛ پایە بەرزی؛ پایە؛ پلە: *( a man of ~; moral ~ )* .

**status** (stā′təs, stat′əs), *n.* (١) باری مرۆڤێك (لە چاوی یاسادا): *( Her ~ is that of a married woman.; the ~ of a minor.)*
(٢) پلەوپایە (بەتایبەتی هی کۆمەڵایەتی)؛ پایە.
(٣) پلەوپایەی بەرز؛ پایە بەرزی؛ گەورەیی.
(٤) بار؛ دۆخ: *( a ~ report; the ~ of their relationship)* .

**status quo** (stā′təs kwō′, stat′əs kwō′), باری ئێستە؛ بارودۆخی ئەو کاتە؛ بارودۆخی ئێستا.

**status quo ante** (stā′təs *or* stat′əs kwō an′ti), باری پێش ئێستە؛ بارودۆخی پێش ئێستا.

**statute** (stach′oot), *n.* (١) پەیڕەو: *( the ~ of a university, corporation, etc.)*
(٢) یاسا؛ یاسای وڵات. (٣) فەرمانی میری یا فەرمانڕەوا.

**statute book,** تۆمارنامەی یاساکان.

**statute law,** یاسا؛ یاسای لە لایەن پەرلەمانەوە دانراو.

**statute mile,** میلی ئاسایی (کە بریتییە لە ٥,٢٨٠ پێ یا ١٧٦٠ یارد).

**statute of limitations,** یاسای ماوە دانانی دادخوازی: یاسایەکە دەڵێت کە تاوان لێکراو دەبێ لە ماوەیەکی تایبەتیدا دادخوازی بکات ئەگینا مافەکەی دەسووتێ.

**statutory** (stach′oo-tôr′i, stach′oo-tō′ri), *adj.* (١) یاسایی؛ هێزی یاسایی هەیە. (٢) یاسا ڕێگەی داوە؛ بەپێی یاسایە؛ یاسایی.
(٣) سزای لەسەرە بەپێی یاسا؛ بەپێی یاسا سزا دەدرێ.

**staunch** (stônch, stänch), *adj.* (١) (ا) ئاوبڕ؛ ئاونەدز.
(ب) پتەو؛ قایم؛ بەهێز؛ باش دروستکراو.
(٢) دڵسۆز؛ پشت پێ بەستراو؛ ڕاست؛ یەك دڵ؛ نەگۆڕ: *( a ~ ally; a ~ supporter of human rights)*

*v.t.* = **stanch.**

**stave** (stāv), *n.* (١) تیرەی بەرچنە و سەبەتە و بەرمیل؛ تووڵ.
(٢) دار؛ کوتەك؛ داردەست. (٣) پلە پەیژە.
(٤) بڕگەی هۆنراوە. (هەروەها " **stanza** ").
(٥) هێڵی ئاسۆیی کاغەزی مۆسیقا. (هەروەها " **staff** ").

*v.t.* (١) کون تێکردن؛ قوپاندن. (٢) تیرە بۆ کردن.

*v.i.* کون تێ بوون (بەلەم)؛ قوپان.

**stave in,** کون تێکردن؛ قوپاندن.

**stave off,** لە خۆ لادان؛ خۆ لێ پاراستن؛ دوور ڕاگرتن؛ خۆ نەدان بەدەستەوە؛ دواخستن: *( The murderer staved off arrest by running away.)*

**staves** (stāvz), *n. alternative pl. of* **staff.** *and pl. of* **stave.**

**stay** (stā), *n.* گوریسی قایم کردن و ڕاگیرکردنی دارکەشتی.

*v.t.* (١) قایم کردن و ڕاگیرکردنی دارکەشتی بە گوریس.
(٢) گۆڕینی گۆشەی دارکەشتی بە جێگۆڕینی گوریسەکانی.

**stay** (stā), *n.* (١) پاڵپشت؛ كۆڵەكە؛ پشتەك.
(٢) مليوانە بەند؛ تيرەيەكى ڕەقە بۆ ڕاگرتنى مليوان و كەمەربەند... هتد.
(٣) (*pl.*)، كەمەربەند؛ پشتێنى سك و كەلەكە؛ كۆرسيە.
(٤) پشتيوان؛ پشتگير: *( He is the main ~ of his family.)*.
*v.t.* (١) پاڵپشتى كردن؛ ڕاگيركردن؛ ڕاگرتن؛ ڕاستكردنەوە.
(٢) دڵنەوايى كردن؛ وورە دانەبەر؛ پشتيوانى كردن.
(٣) (**~ on ; ~ upon**)، كردن بە بناغە يا پاڵپشت؛ پێ ڕاگيركردن؛ پشتگيرى پێ كردن.

**stay** (stā), *v.i.* (١) مانەوە؛ لە شوێن يا دۆخى خۆدا مانەوە؛ نەگۆڕان:
*( She ~ed at home.; The weather ~ed bad for a week.; These clothes won't ~ white.)*
(٢) مانەوە بۆ ماوەيەكى كورت؛ گل خواردنەوە؛ بەنگ بوون:
*( We ~ed at a hotel for two days.)*
(٣) وەستان؛ ڕاوەستان؛ نەجووڵان.
(٤) ڕاوەستان بۆ ماوەيەكى كورت؛ چاوەڕێ كردن؛ خۆ دواخستن:
*( ~ a little before continuing on your trip.)*
(٥) [Colloq.]، خۆڕاگرتن؛ كۆڵنەدان؛ لە ڕێ لانەدان:
*( to ~ the course)*
(٦) [Colloq.]، دوانەكەوتن (پێشبڕكێ)؛ گرتنەوە.
(٧) [Archaic]، لەسەر مەلۆنستى خۆ سووربوون؛ مەلۆنستى خۆ نەگۆڕين؛ خۆ نەدان بەدەستەوە.
*v.t.* (١) وەستاندن؛ ڕاگرتن؛ ڕاگيركردن؛ ڕێ لێگرتن؛ كۆسپ خستنەسەر ڕێ.
(٢) دواخستن (فەرمانى دادگا): *( to ~ an execution)*.
(٣) [Rare]، كوژاندنەوە (ناشووب)؛ دامركاندنەوە.
(٤) تينوێتى شكاندن؛ ئارەزوو شكاندن.
(٥) مانەوە هەتا دوايى هاتنى ماوەيەكى تايبەتى:
*( He ~ed the week out.)*
(٦) [Archaic]، چاوەڕێ كردن.
*n.* (١) (أ) وەستان؛ وەستێنران. (ب) وەستانێكى كورت؛ ڕاوەستانێكى كەم.
(٢) دواخستن (فەرمانى دادگا)؛ ڕاگرتن:
*( The man was given a ~ of execution.)*
(٣) (أ) مانەوە بۆ ماوەيەك.
(ب) ماوەى ئەم مانەوەيە: *( She had a long ~ in the hospital.)*.
(٤) [Colloq.]، خۆڕاگرتن؛ بەرگەگرتن؛ دەربردن.
(٥) [Archaic]، وەستان؛ چەقين؛ جووڵە نەكردن.
(٦) [Obs.]، (أ) كۆسپ (ڕێ). (ب) دابينكارى؛ ڕاگرتن.

**staying power,** بەرگەگرتن؛ خۆڕاگرتن؛ دەربردن؛ كۆڵنەدان.

**stay-sail** (stā'sāl), *n.* بايەوانى ڕاگيركەر.

**stead** (sted), *n.* (١) لە جێى؛ لەجياتى؛ لەبريتى؛ جێ:
*( If you can't come to the meeting, send her in ~.)*
(٢) سوود؛ كەڵك.
(٣) [Archaic or Dial]، جێ؛ شوێن.
*v.t.* [Archaic], بۆ بەسوودبوون؛ بۆ بەكەڵك بوون.
**stand (one) in good stead,** بەسوودبوون (بەتايبەتى لەكاتى تەنگانەدا)؛ بەكەڵك بوون؛ كەڵك هەبوون.

**steadfast** (sted'fast', sted'fäst'), *adj.* (١) بەردەوام؛ نەگۆڕ؛ جێگير *( a ~ gaze)*.
(٢) پشت پێ بەستراو؛ دڵسۆز؛ يەك دڵ؛ نەگۆڕ.
-**steadfastly** *(adv.)*; **steadfastness** *(n.)*.

**steading** (sted'iŋ), *n.* [Scot. & Dial.], (١) خانووى ناو كێڵگە.
(٢) جێ خانوو.

**steady** (sted'i), *adj.* (١) جێگير؛ پتەو؛ قايم:
*( a ~ foundation, table, etc.)*
(٢) (أ) بەردەوام؛ هەميشە؛ نەگۆڕ *( a ~ gaze; a ~ rise in prices)*.
(ب) سەرومر؛ هەميشەيى *( a ~ job)*.
(٣) نەگۆڕ (ڕەووشت، مرۆڤ)؛ پشت پێ بەستراو.
(٤) هێمن؛ لەسەرخۆ؛ خۆڕاگر: *( ~ nerves)*.
(٥) شت بە توند گر؛ سەنگين.
(٦) لارەولارنەكەر (كەشتى لە زرياندا)؛ بە ڕاستى و ڕێكوپێكى ڕۆيشتوو.
*interj.* (١) هێمن بە!؛ خۆت ڕاگرە!؛ بەردەوام بە لەسەر كارەكەت!.
(٢) كەشتييەكە لێخورە بە هەمان شێوە بەبێ لادان و ڕێ گۆڕين (فەرمانى سەرەك كەشتييەوان).
*v.t.* جێگيركردن؛ ڕاگيركردن؛ چەسپاندن؛ لەنگەرگرتن: *( to ~ a boat)*.
*v.i.* جێگيربوون؛ ڕاگيربوون؛ لەنگەرگرتن.
*n.* [Slang], دڵدارى سەرومر؛ دڵدار؛ يار؛ دەنك.
-**steadily** *(adv.)*; **steadiness** *(n.)*.
**go steady,** [Colloq.], يارى كەسێك بوون بە سەرومرى؛ دڵدارى كردن بە سەرومرى لەگەڵ يەك كەسدا:
*( They have been going steady for a year.)*

**steak** (stāk), *n.* (١) توێ گۆشتى گا (بۆ برژاندن).
(٢) توێ گۆشتى گاى برژاو.

**steal** (stēl), *v.t.* (١) دزين.
(٢) بە دزييەوە سەيركردن؛ بە دزييەوە كردن: *( He ~s a look.)*
(٣) بە دزييەوە لێسەندن؛ بردن بە نهێنى؛ لێ دزين (مەجاز).
*( He ~s her heart.)*
(٤) بە دزييەوە چوونەناو.
*v.i.* (١) دزى كردن.
(٢) بە دزييەوە هاتن يا ڕۆيشتن؛ بەبێ خشپە يا بە ئەسپايى هاتن‌وچوون.
*n.* (١) دزى؛ دزين.
(٢) شتێكى زۆر هەرزان؛ تۆڵەكە (مەجاز):
*( That shirt at that price is a ~.)*

**stealing** (stēl'iŋ), *n.* (١) دزى؛ دزى كردن.
(٢) (*pl.*)، شتى دزراو؛ تالانى.
*adj.* دز؛ ئەوەى كە دەدزێ.

**stealth** (stelth), *n.* (١) جووڵانەوەى نهێنى؛ كاركردنى نهێنى؛ كارى نهێنى؛ ڕەفتارى نهێنى. (٢) نهێنێتى؛ دزێتى؛ بێ خشپەيى؛ بێ چركەيى.
(٣) [Obs.]، دزى.
(٤) [Obs.]، بە نهێنى ڕۆيشتن؛ بە دزييەوە ڕۆيشتن.

**stealthily** (stel'thə-li), *adv.* بە دزييەوە؛ بە نهێنى؛ بەبێ خشپە؛ بە ماتەمات؛ بەبێ چركە.

**stealthy** (stel'thi), *adj.* نهێنى؛ بە دزييەوە كراو؛ پەنهان.
-**stealthiness** *(n.)*.

**steam** (stēm), *n.* (١) هەڵم؛ هاڵاو؛ هەڵم‌وهاڵاو.
(٢) هێزى هەڵم: *( Many sailing vessels were converted to ~.)*.
(٣) [Colloq.]، تين؛ هێز؛ ووزە: *( to lose ~ )*.
*adj.* (١) هەڵمى؛ هەڵم؛ بە هەڵم لێخوڕاو يا گەرم كراو. (٢) هەڵمبەر (بۆرى).
(٣) هەڵم لێدراو.
*v.i.* (١) هەڵم لێ هەڵسان؛ هەڵم‌وهاڵاو لێ هەڵسان؛ هاتنەكوڵ.
(٢) وەك هەڵم بەرزبوونەوە. (٣) بە هەڵم داپۆشران (پەنجەرە، شووشە).
(٤) بە هەڵم كاركردن؛ بە هەڵم ڕۆيشتن.
(٥) تووڕەبوون:
*( He was ~ing over the insult he had received.)*
*v.t.* (١) هەڵم بەكارهێنان (بۆ پاككردنەوە، سەوزە لێنان يا كوڵاندن... هتد).
(٢) هەڵم لێ هەڵسان؛ هەڵم‌وهاڵاو لێوە بەرزبوونەوە.
**let (or blow) off steam,** [Colloq.], هەستى خۆ دەربڕين (بەتايبەتى ناڕەزايى و سكاڵا)؛ هەڵڕشتنى ئەوەى لە دڵدايە.

**steam-boat** (stēm'bōt'), *n.* = **steamship.**

**steam-boiler,** مەنجەڵى هەڵمى.

**steam engine,** مەكينەى هەڵم.

**steamer** (stēm'ēr), *n.* (١) **steamship**. (٢) **steam engine**.

(٢) دەفرێکە کە شتی تێدا لە هەڵم دەدرێت.
**steam fitter,** فیتەر یا مەکینەچی بۆری هەڵم.
**steam heating,** گەرمکردنەوە بە هەڵم؛ گەرمی هەڵم.
**steam iron,** ئوتووی هەڵم
**steam-roller,** (١) باگردێنی هەڵم.
(٢) مێزێکی توندو بێ بەزەیی؛ هێزو دەسەڵاتێکی بەزەبرو دڵڕەق.
*v.t.* (١) ڕێگە کوتانەوەو ڕێك کردن بە باگردێنی هەڵم.
(٢) پلیشاندنەوە؛ هاڕین؛ بە دڵڕەقانە پێشێل کردن؛ بەبێ بەزەییانە بەزاندن:
***( He ~ed the opposition.)***
(٣) بەزۆر یاسا مۆرکردن بە ئەندامانی پەرلەمان؛ بە زۆر شت پێ کردن؛
ڕای خۆ بە زۆر سەپاندن بەسەر خەڵکدا.
*v.i.* بەزۆر شت پێ کردن؛ بەزۆر سەپاندن بەسەردا؛ بە توندوتیژی ڕەفتار
نوواندن
*adj.* زۆرەملێ؛ هی زۆردارەکی یا زۆر: ***( ~ tactics)*** .
**steamship** (stēm′ship´), *n.* کەشتی هەڵم.
**steam shovel,** مەکینەی زەوی هەڵکەندنی هەڵم.
**steam table,** مێزی هەڵم مێزێکە لە چێشتخانەدا دەفری گەورەی پڕ
لە خواردەمەنی کوڵاوی لەسەر دادەنرێ‌و لە ژێرەوە بە هەڵم خواردنەکە بە گەرمی
دەهێڵرێتەوە
**steam-tight** (stēm′tīt´), *adj.* هەڵمبڕ: ***( a ~ valve)*** .
**steam turbine,** تەربینە یا مەکینەی هەڵم.
**steamy** (stēm′i), *adj.* (١) هەڵمی. (٢) بە هەڵم داپۆشراو؛ پڕ لە هەڵم؛
پڕ هەڵم (٢) هەڵمی لێوە دێتەدەرەوە؛ هەڵمرهاڵاو لێ هەڵساو.
**-steamily** ***(adv.)***; **steaminess** ***(n.).***
**steapsin** (sti-ap′sin), *n.* ستیپسن ئەنزیمێکە لە ئاووکی پەنکریاسدا
چەوری دەگۆڕێ بۆ گلیسرین‌و ترشەڵۆك.
**stearic** (sti-ar′ik, stêr′ik), *adj.* چەوری؛ لە چەورییەوە وەرگیراو؛
هی چەوری.
**steatite** (stē′ə-tīt´), *n.* = **soapstone.**
**steatopygia** (stē´ə-tō-pī′ji-ə, stē´ə-tō-pij′i-ə), *n.* سمت زلی
بەهۆی چەوری کۆبوونەوەوە (بەتایبەتی لە ژنی قولەڕەشدا).
**stedfast** (sted′fast´, sted′fäst´), *adj.* = **steadfast.**
**steed** (stēd), *n.* (١) ئەسپ؛ ئەسپی سواری.
(٢) [Archaic]، ئەسپی خۆش ڕەوت؛ ئەسپی بە دەماخ.
**steel** (stēl), *n.* (١) پۆلا؛ (٢) جۆرە پۆلایەکی تایبەتی.
(٣) شتی پۆلایین: (ا) شیر؛ خەنجەر. (ب) ئەستێ.
(ج) تیرەیەکی پۆلایینە بۆ کەمەربەند ڕەق کردن. (د) شیشی چەقۆ تیژکردنەوە.
(٤) سەختی؛ ڕەقی؛ هێز؛ پتەوی؛ پۆلایانە:
***( sinews of ~ ; nerves of ~ )***
(٥) ( *pl* ) ، نرخی بەشی کۆمپانیای پۆلا (پارەبازی).
*adj.* پۆلایین؛ ڕەق؛ سەخت.
*v.t.* (١) پۆلا لێدان؛ بە پۆلا داپۆشین.
(٢) وەك پۆلا لێکردن؛ سەختکردن؛ ڕەق کردن؛ هەست مراندن یا کوشتن.
**steel blue,** شینی پۆلایی
**steel engraving,** (١) نەخشی هەڵکەنراو لەسەر تەبەقی پۆلا.
(٢) وێنەی لەم نەخشەیە وەرگیراو.
(٣) شێوازی ئەم نەخش هەڵکەندن‌و وێنەگرتنە.
**steel-head** (stēl′hed´), *n.* سەرپۆلایی: جۆرە
ماسییەکە.
**steel mill,** کارگەی پۆلا.
**steel wool,** تەل باریکی پۆلایین (بۆ پاکردنەوەو ساف‌ولووس کردنی
دەفری وەك مەنجەڵ).
**steel-work** (stēl′wũrk´), *n.* (١) شتومەکی پۆلایین.
(٢) چوارچێوەی پۆلایین. (٣) (*pl.*) ، **steel mill** .
**steel-worker** (stēl′wũr´kẽr), *n.* کرێکاری کارگەی پۆلا.

**steely** (stēl′i), *adj.* (١) پۆلایین؛ لە پۆلا درووستکراو.
(٢) پۆلایی؛ لە پۆلا دەچێ لە ڕەنگ‌و سەختیدا.
**steel-yard** (stēl′yärd´), *n.* قەپان.
**steenbok** (stēn′bok´), *n. Also* **steinbok,** ئاسکێکی بچووکی
ئەفەریقاییە.
**steep** (stēp), *adj.* (١) لێژ: ***( a ~ hill)*** .
(٢) [Colloq.]، (ا) زۆر گران؛ زۆر بەرز: ***( ~ prices )*** .
(ب) لە ئەندازە بەدەر؛ ئەوپەڕی؛ زیادەڕۆ: ***( a ~ statement)*** .
(٣) [Obs.]، بەرز (شاخ)؛ بڵند.
*n.* لێژایی؛ لێژگە؛ سەربەرەو خوارە.
**-steepy** ***(adv.)***; **steepness** ***(n.).***
**steep** (stēp), *v.t.* (١) نوقوم کردن (لە ئاو یا شلەی تردا). (٢) خووساندن.
*n.* (١) نوقوم کردن؛ نوقوم بوون؛ خووسان.
(٢) شلەو ئاوی شت تێدا خووسان یا نوقوم کردن.
*v.i.* نوقوم کران؛ خووسان.
**steeped in,** پڕە لە؛ تێدا نوقم بووە؛ هەمووی گرتۆتەوە:
***( steeped in hatred )***
**steepen** (stēp′′n), *v.t.* لێژکردن.
*v.i.* لێژبوون؛ لێژبوونەوە.
**steeple** (stē′p'l), *n.* (١) قوللەی کڵێسە. (٢) لووتکەی قوللەی کڵێسە.
**steeple-chase** (stē′p'l-chās´), *n.* (١) غارغارێنی دەشت.
(٢) غارغارێنی بەسەر جۆگەو کەندو کۆسپدا بازدان.
(٣) ڕاکردن یا پێشبڕکێی دەشت‌ودەر.
**-steeple-chaser** ***(n.).***
**steeple-jack** (stē′p'l-jak´), *n.* کارگەرێکە قوللەی کڵێسەو شوێنی
ترو دووکەڵکێش چاك دەکاتەوەو بۆیە دەکات بە پیاهەڵگەڕانیانا.
**steer** (stêr), *v.t.* (١) لێخوڕین؛ ڕاندن؛ ئاژووتن.
***( to ~ a ship, boat, automobile, etc.)***
(٢) لێخوڕان؛ بۆ لێخوڕین باش بوون یا خراپ بوون:
***( The car ~s easily.)***
(٣) ڕێ بۆ دانان؛ بردن بەڕێوە؛ ڕێی تایبەتی گرتن.
*n.* [Slang], ئامۆژگاری یا سووسەی بەکەڵك؛ پێشنیاری بەسوود.
**steer clear of,** لێ دوورکەوتنەوە؛ خۆ لێ دوورخستنەوە.
**steer** (stêr), *n.* (١) پارێنی خەساو. (٢) جوانەگا.
**steerage** (stêr′ij), *n.* (١) ئاژووتن؛ ڕاندن؛ ڕابەری.
(٢) هەرزانترین جێی کەشتی ڕێبواران.
**steering column,** ستوونی دەستاژوو یا سوکان.
**steering committee,** لێژنەی ڕابەری؛ لێژنەی بەڕێوەبردن.
**steering gear,** ئامێری ئاژووتن یا لێخوڕین.
**steering wheel,** دەستاژوو؛ سوکان؛ چەرخی ئاژووتن؛ ستێرن.
**steersman** (stêrz′mən), *n.* ڕانەری کەشتی‌و بەلەم.
**steeve** (stēv), *v.t.* بار ئاخنینە ناو کەشتییەوە بە داری قولاپاوی یا
ئامێری بەرزکردنەوە.
*n.* داری قولاپاوی یا ئامێری بەرزکردنەوەی وەها.
**steeve** (stēv), *n.* گۆشەی داری پێش کەشتی.
*v.t. & v.i.* بە لاری دانانی داری پێش کەشتی.
**stegosaurus** (steg´ə-sô′rəs), *n.* گیاندارێکی خشۆکی گەورەی
فڕتێکەوتووە. لە توخمی " داینەسۆر " .
**stein** (stīn), *n.* (١) گڵێنەی بیرە خواردنەوە. (٢) کۆچەڵە یا پەرداخی بیرە.
**steinbok** (stīn′bok´), *n.* = **steenbok.**
**stela** (stel′ə), *n.* (١) کێل. (٢) بەرد یا تەبەقی شت لەسەر هەڵکەنراو
( کە دەنرێ بە قەد دیوارەوە).
**stele** (stē′li), *n.* (١) کێل. (٢) بەرد یا تەبەقی شت لەسەر هەڵکەنراو
(کە دەنرێ بە قەد دیوارەوە). (٣) ناوەڕۆکی قەف‌و ڕەگی ڕووەك.
**-stelar** ***(adj.).***

**stellar** (stel′ẽr), *adj.* (١) ئەستێرەیی؛ تایبەتی بە ئەستێرە.
(٢) لە ئەستێرەچوو؛ ئەستێرەیی.
(٣) هی قارەمانی فیلمی سینەما: ( *~ names* ).
(٤) (ا) سەرەکی: ( *the ~ role in a play)*.
(ب) نایاب؛ زۆر باش

**stellate** (stel′it, stel′āt), *adj.* ئەستێرەیی؛ شێوە ئەستێرەیی.

**stelliform** (stel′i-fôrm′), *adj.* = stellate.

**stellular** (stel′yoo-lẽr), *adj.* (١) ئەستێرەیی.
(٢) بە پەڵەی ئەستێرەیی رەنگاورەنگ داپۆشراو.

**stem** (stem), *n.* (١) (ا) قەف؛ لاسك؛ قالۆر؛ دارك؛ دەمار. (ب) قەد.
(٢) (ا) قنچك (گەڵا؛ گوڵ). (ب) لاسکە مۆز. (٣) دەسك (پەرداخ یا بادەی مەی).
(٤) (ا) قەفی تیپ. (ب) قەفی نۆتەی مۆسیقا.
(٥) پێشی کەشتی؛ پێشەڵی کەشتی و بەلەم.
(٦) ریشە (ووشە)؛ بنکە (ووشە).
(٧) (ا) لق (خێزان، خێڵ)؛ پەل. (ب) بنەچە؛ بنەماڵە؛ باوباپیر.

*v.t.* (١) قنچك کردن (میوە)؛ قنچك لێکردنەوە.
(٢) قنچك بۆ کردن (گوڵی دەستکرد).
(٣) دڕپێدان: بۆ پێشەوە رۆیشتن بە گران.

*v.i.* لێوەهاتن یا هەڵقوڵان؛ لێوە پەیدابوون؛ لێ کەوتنەوە:
*( Poverty ~s from war.)*

from stem to stem, (١) لەم سەری کەشتییەوە بۆ ئەو سەری.
(٢) سەرانسەر؛ سەرتاسەر.

**stem** (stem), *v.t.* (١) بەربەستکردن (رووبار، لێشاو، لافاو)؛ بەرگرتن.
(٢) وەستاندن؛ گرتنەوە: ( *to ~ the flow of blood)*.
(٣) کون ئاخنین؛ کون پڕکردنەوە؛ داخستن.

*v.i.* وەستان (بەفرەخلیسکێ)؛ خۆگرتنەوە.

*n.* وەستان (بەفرەخلیسکێ): شێوەی وەستان.

**stemmed** (stemd), *adj.* (١) دەسکدار (پەرداخ، کاسە):
*( a thin- ~ goblet)*
(٢) قنچك کراو (میوە).

**stemmer** (stem′ẽr), *n.* قنچککەر؛ لاسك لێکەرەوە.
*( a fruit ~ ; a tobaco ~ )*

**stemware** (stem′wâr), *n.* پەرداخ و کاسەی دەسکدار.

**stench** (stench), *n.* بۆگەن؛ بۆن دڕن؛ بۆنێکی پیس.

**stencil** (sten′s'l), *v.t.* بە ستێنسڵ نووسین یا نیشانەکردن.

*n.* ستێنسڵ؛ کاغەزە مۆمینەی چاپ.

-stenciler; stenciller *(n.)*.

**steno-** (sten′ō, sten′ə), پێشگرێکە بەمانای: بچووك؛ تەنك؛ تەسك؛ کورتکراوە: *( stenography )*

**stenograph** (sten′ə-graf′, sten′ə-gräf′), *v.t.* کورت نووسین؛ بە نیشانە نووسین؛ بە کورتی نووسین.

*n.* (١) نووسینی کورتکراوە؛ نووسراوی نیشانەیی. (٢) نیشانەی کورتنووسی.
(٣) ئامێری کورتنووسی؛ ئامێری نیشانەنووسی.

**stenographer** (stə-nog′rə-fẽr), *n.* کورتنووس؛ نیشانەنووس.

**stenographist** (stə-nog′rə-fist), *n.* = stenographer.

**stenography** (stə-nog′rə-fi), *n.* کورتنووسی؛ نیشانەنووسی.

-stenographic; stenographical *(adj.)*; stenographically *(adv.)*.

**stenosis** (sti-nō′sis), *n.* هاتنەوەیەکی بۆری (پزیشکەوانی).

**stenotopic** (sten′ə-tô′pik), *adj.* بە ئاسانی رانەهاتوو لەگەڵ دەوروبەردا (زیندەوەرزانی).

**stenotype** (sten′ə-tīp′), *n.* (١) نیشانەی دەنگێك یا ووشەیەکە لە کورتەنووسیدا. (٢) ئامێری کورتەنووسی؛ ئامێری نیشانەنووسی.

**stenotypy** (sten′ə-tīp′i), *n.* جۆرێکە لە کورتەنووسی.

**stentorian** (sten-tôr′i-ən, sten-tō′ri-ən), *n.* زۆر بەرز (دەنگ).

**step** (step), *n.* (١) هەنگاو.
(٢) ماوەیەکی کورت: *( The hotel is just a ~ from here.)*.
(٣) رەوت. (٤) دەنگی پێ. (٥) شوێن پێ؛ جێ پێ.
(٦) پلە پەیژە؛ پێ پێلکە؛ پا پێلکە؛ پلەی پێ پلیکانە.
(٧) *(pl.)* ، (ا) پێ پلیکانە؛ قالدرمە. (ب) [British]، پەیژەی نوشتاوە.
(٨) (ا) رەفەی کانگاو کانە بەرد. (ب) بنکەی دارکەشتی.
(٩) پلە؛ نمرە؛ قۆناغ.
(١٠) هەنگاو؛ کردار: *( Let me explain the next ~ .)*.
(١١) هەنگاوی دووبارەکراوە (سەما).

*v.i.* (١) هەنگاونان؛ هەنگاو هەڵهێنانەوە. (٢) رۆیشتن بۆ ماوەیەکی کورت
(٣) هەنگاونان لە سەماکردندا. (٤) بە گورجی جووڵانەوە.
(٥) چوون بەسەردا؛ چوونەناو: *( He ~ed into a small fortune.)*
(٦) (ا) پێ پیانان: *( He accidently ~ed on my foot.)*.
(ب) پێ پیانان؛ پێ لێ داگرتن: *( He ~ed on the accelerator.)*.

*v.t.* (١) هەنگاونان؛ هەنگاو هەڵهێنانەوە. (٢) پێ دانان.
(٣) بە هەنگاو پێواندن.
(٤) (ا) پێ پێلکە بۆ کردن؛ پێ پێلکانە لێ هەڵکەندن:
*( He ~ed the hill leading to his house.)*
(ب) پلە پلەکردن.
(٥) قایم کردن یا داچەقاندنی دارکەشتی لە بنکەکەیدا.

in step, (١) بە ریز؛ بە رێك‌وپێکی و پێکەوە (سەما، رێ رۆیشتن، رەوتی سەربازی). (٢) گونجاو (لەگەڵ دەوروبەری خۆدا)؛ سازاو.

keep step, لە ریزدا مانەوە؛ هەنگاو کردن بە یەك لەگەڵ ئاوەڵەکاندا.

out of step, لە ریز دەرچوو؛ نەگونجاو؛ نەسازاو.

step by step, پلە پلە؛ ووردە ووردە؛ بەرەبەرە؛ هەنگاو بە هەنگاو.

step down, (١) واز لە کار هێنان؛ دەستبەرداربوون لە کار:
*( She stepped down as prime minister last year.)*
(٢) هێنانە خوارەوە؛ داشکاندن؛ پلە نزم کردنەوە؛ کەمکردنەوە.

step in, خۆتێهەڵقورتاندن؛ کەوتنە بەینەوە؛ دەست تێخستن.

step on it, [Colloq.], پەلە کە؛ خێرا کە؛ پێی پیانێ.

step out, (١) چوونەدەرەوە (لە ژوورێك بۆ ماوەیەکی کەم).
(٢) [Colloq.]، چوونەدەرەوە بۆ رابواردن.
(٣) بە هەنگاوی گەورەو بە گورجی رۆیشتن.
(٤) خۆکشاندنەوە؛ وازهێنان؛ دەستهەڵگرتن.

step up, (١) هاتنە پێشەوە؛ چوون بەرەو:
*( She stepped up to the microphone.)*
(٢) پێشکەوتن؛ بەرەو پێشەوە چوون.
(٣) ووردە ووردە زیادکردن؛ پێ لێ هەڵبڕین:
*( They stepped up their attacks on the enemy.)*

take steps, هەنگاوی پێویست نان (بۆ جێبەجێکردنی کارێك).

watch one's steps, (١) ئاگا لە بەر پێی خۆ بوون؛ وورپای بەر پێ خۆ بوون. (٢) [Colloq.]، وورپابوون؛ ئاگاداربوون.

**step-brother** (step′bru*th*′ẽr), *n.* کوڕی باوەپیاو یا باوەژن.

**step-child** (step′chīld′), *n.* زڕکوڕ؛ زڕکچ؛ هەنەزا؛ منداڵی مێرد یا ژن.

**step-dame** (step′dām′), *n.* [Archaic], = step-mother.

**step-daughter** (step′dô′tẽr), *n.* زڕکچ؛ هەنەزا (کچ)؛ کچی مێرد یا ژن.

**step-down** (step′doun′), *adj.* پلە پلە کەم کراوە؛ کەم بوونەوەی پلە پلە؛ چوونەوەیەك: *( a ~ gear)* .

**step-father** (step′fä′*th*ẽr), *n.* باوەپیاو؛ زڕباوك؛ زڕباب.

**step-ins** (step′inz′), *n.pl.* (١) دەرپێی کورتی ژێرەوەی دەڵبی ژنانە.
(٢) پێڵاوی پاژنە نزم؛ سۆڵ؛ نەعل.

**step-ladder** (step′lad′ẽr), *n.* پەیژەی نوشتاوە.

**stepmother** (step′mu*th*′ẽr), *n.* باوەژن؛ زڕدایك.

**step-parent** (step′pâr´ənt), *n.* باوەژن؛ باوەپیاو.
**steppe** (step), *n.* دەشتی پان و رووتەنی؛ دەشت.
**stepper** (step′ĕr), *n.* (۱) کەسێکی بە قنجوقیت و ڕێک و پێک رۆیشتوو. (۲) [Slang] سەماکەر.
**stepping-stone** (step′iŋ-stōn´), *n.* (۱) بەردە بازد. (۲) هۆی گەیشتنە ئامانج.
**step-sister** (step′sis´tĕr), *n.* زڕخوشك؛ کچی باوەژن یا باوەپیاو.
**step-son** (step′sun´), *n.* زڕکوڕ؛ هەنەر؛ (کوڕ)؛ کوڕی مێرد یا ژن لە شوویەك یا لە ژنێکی تر.
**step-up** (step′up´), *adj.* بە پلە پلە زیادکردوو.
*n.* بە پلە پلە زیادکردن
**step-wise** (step′wīz´), *adv.* پلە پلەیی؛ بە پلە پنە نیشانەکراو.
**-ster** (stĕr), پاشگرێکە بەمانای: (ا) بکەر؛ دروستکەر *(trickster)*. (ب) بەشدار *(gangster)*. (ج) کەسێکی تایبەتی *(youngster, oldster)*.
**stercoraceous** (stûr´kə-rā′shəs), *adj.* شیاکەیی؛ ڕیتاڵەیی؛ گوویی
**stercorous** (stûr′kə-rəs), *adj.* = stercoraceous.
**stere** (stêr), *n.* مەترە سێجا
**stereo** (ster′i-ō), *n.* ستێریۆ ئامێر یا شێوەی لێدانی مۆسیقاو گوێ لێبوونی بە دوو بلندگۆ.
**stereo-, stere-** (ster′i-ō, stêr′i-ə), پێشگرێکە بەمانای: پتەو؛ سێلایی *(stereoscope; stereography)*
**stereobate** (ster′i-ə-bāt´, stêr′i-ə-bāt´), *n.* بناغەی خانوو؛ بنچینە؛ بنکەی پایە
**stereochemistry** (ster´i-ə-kem′is-tri), *n.* کیمیای تەندار: لە ڕێك و پێکی گەردیلەکان دەکۆڵێتەوە کە گەرد، واتە " مۆلیکیول " پێکدێنن.
**stereography** (ster´i-og′rə-fi), *n.* ستێریۆگرافی دروستکردنی وێنەی تەندار لەسەر ڕووی تەخت (ئەندازەی تەندار)
-stereographic; stereographical *(adj.)*; stereographically *(adv.)*.
**stereometry** (ster´i-om′ə-tri, stêr´i-om′ə-tri), *n.* پێوانی قەوارەو پانی و درێژی وێنەی تەندار
-stereometric; stereometrical *(adj.)*; stereometrically *(adv.)*.
**stereophonic** (ster´i-ə-fon′ik), *adj.* ستێریۆفۆنی (مۆسیقا): تایبەتی بە دەنگێکە کە بە " ستێریۆ " تۆمار کرابێ و لێ بدرێتەوە، واتە دەنگی دوولایی
**stereoscope** (ster′i-ə-skōp´), *n.* ستێریۆسکۆپ: ئامێرێکە وێنە بە تەنداری بۆ چاو دەردەخات.
**stereoscopic** (ster´i-ə-skop′ik), *adj.* *Also* stereoscopical, (۱) ستێریۆسکۆپی سێلایی. (۲) تایبەتی بە ستێریۆسکۆپ و بەکارهێنانی.
-stereoscopically *(adv.)*.
**stereoscopy** (ster´i-os′kə-pi), *n.* (۱) بینینی وێنە بە سێلایی (۲) دروستکردن و بەکارهێنانی ستێریۆسکۆپ.
-stereoscopist *(n.)*.
**stereotype** (ster′i-ə-tīp´), *n.* (۱) قالب؛ چاپەمەنی؛ کلێشە. (۲) ووشکە شێواز؛ ووشکە نموونە
*(The American Indian is often portrayed as a ~.; He is the ~ of a salesman.)*
*v.t.* (۱) (ا) ووشکە شێواز دروستکردن دەربارەی: نموونەیەکی نەگۆڕ یا یەك نەرا حستنە مێشکی خۆوە دەربارەی ڕەگەزێك، چینێك، پیشەیەك، بابەتێ شت... هتد: وەك کلێشە لێکردن. (ب) دووبارەکردنەوە بەبێ هیچ گۆڕینێك. (۲) لەسەر کلێشە دەرهێنان: لەسەر قالب چاپ کردن یا دروستکردن.

-stereotyper *(n.)*; stereotypic; stereotypical *(adj.)*.
**stereotyped** (ster′i-ə-tīpt´, stêr′i-ə-tīpt´), *adj.* (۱) ووشکە نموونەیی؛ ووشکە شێوازی؛ کلێشەیی؛ دووبارەکراو بەبێ گۆڕین؛ یەك قالبی. (۲) لەسەر یەك کلێشە دەرهێنراو؛ لەسەر یەك قالب چاپکراو.
**stereotypy** (ster′i-ə-tīp´i, stêr′i-ə-tīp´i), *n.* (۱) (ا) کلێشە دروستکردن؛ قالب دروستکردن. (ب) لەسەر کلێشە دەرهێنان؛ لەسەر قالب چاپ کردن. (۲) دووبارەکردنەوەی ڕاو نەریت و خوو بەبێ گۆڕین (دەروونناسی)؛ کلێشەیی ڕەفتار.
**sterile** (ster′'l, ster′il), *adj.* (۱) نەزۆك؛ وەجاخ کوێر؛ بێ وەجاخ؛ زڕ. (۲) بێ بەر؛ بێ پیت؛ ووشکانی؛ ڕووتەنی: *(~ land, soil, etc.)*. (۳) ووشك؛ ناخۆش: *(a ~ lecture, style, etc.)*. (٤) بێ ئەنجام؛ بێ بەر؛ بێ سوود: *(a ~ policy)*. (٥) لە میکرۆب پاکراوە؛ خاوێن؛ بێ میکرۆب؛ خاوێن کراو.
**sterility** (stə-ril′ə-ti), *n.* (۱) نەزۆکی؛ بێ وەجاخی؛ زڕی. (۲) بێ بەری؛ بێ ئەنجامی؛ بێ سوودی.
**sterilization** (ster´ə-lī-zā′shən), *n.* پاکردنەوە لە میکرۆب؛ خاوێنکردنەوە لە میکرۆب؛ خاوێن کردن.
**sterilize** (ster′ə-līz´), *v.t.* (۱) نەزۆك کردن (بەتایبەتی بە نەشتەرکاری)؛ لە زاوزێ خستن؛ وەجاخ کوێرکردنەوە. (۲) پاکردنەوە لە میکرۆب؛ خاوێن کردن؛ پاکژکردنەوە.
**sterilizer** (ster′ə-līz´ĕr), *n.* میکرۆبکوژ؛ خاوێنکەر؛ پاککەرەوە.
**sterling** (stûr′liŋ), *n.* (۱) پارەیەکی زیوی ئینگلیزی کۆنە. (۲) ئەستەرلینی؛ پاوەنی ئینگلیزی. (۳) پارەی ئینگلیزی زێڕ یا زیو. (٤) (ا) **sterling silver**. (ب) پێویستی سەر مێزی نانخواردنی لە زیو دروستکراو (وەك کەوچك و چنگاڵ).
*adj.* (۱) ئەستەرلینی؛ تایبەتی بە پارەی ئینگلیزی. (۲) لە زیوی پوخت دروستکراو. (۳) ڕەسەن؛ نایاب؛ زۆر چاك؛ بێگەرد؛ پاك؛ پوخت: *(a man of ~ principles)*
**stern** (stûrn), *adj.* (۱) توندوتیژ؛ بە زەبروزەنگ؛ سەخت؛ ڕەق (ڕەفتار): *(~ measures, treatment, etc.)* (۲) مڕومۆن؛ مۆن؛ چارە ترش؛ گرژ؛ ڕووگرژ: *(a ~ face, look, etc.)*. (۳) کۆڵنەدەر؛ بێ پەروا: *(~ purpose)*.
**stern** (stûrn), *n.* (۱) پاشەڵی کەشتی و بەلەم؛ پشتەوەی کەشتی و بەلەم. (۲) پاشەڵ؛ بەشی پاشەوە یا دواوە.
**sternal** (stûr′n'l), *adj.* تایبەتی بە ئێسکەکۆڵە؛ هی ئێسقانی بەرسنگ.
**stern chase,** شوێن کەوتن یا ڕاوناندنی کەشتییەك بۆ کەشتییەکی تر زۆر لە نزیکەوە.
**stern chaser,** تۆپی پاشەڵی کەشتی (کە دەنرێ بەو کەشتییەی دوایەوە کە ڕای دەفرێنێ یا شوێنی کەوتووە).
**sternforemost** (stûrn´fôr′mōst, stûrn´fōr′məst), *adj.* (۱) بۆ دواوە؛ بەرەو دواوە (بەجۆرێك کە پشتی کەشتییەکە ڕووی لەپێشەوە بێت). (۲) بە ناقۆڵایی؛ بە نارەحەتی.
**sternmost** (stûrn′mōst, stûrn′məst), *adj.* (۱) نزیکترین لە پاشەڵی کەشتییەوە؛ لە هەرە دوای پاشەڵی کەشتییەوە. (۲) لە دوای دواوە؛ دواترین؛ هەرە دوا.
**sternpost** (stûrn′pōst´), *n.* ستوونی پاشەڵی کەشتی (کە دەستاژووی کەشتییەکەی لەسەرە).
**stern sheets,** بەشی دواوەی بەلەمی سەر بەتاڵ.
**sternum** (stûr′nəm), *n.* ئێسکەکۆڵە؛ ئێسقانی بەرسنگ؛ بەرسنگ.
**sternutation** (stûr´nyoo-tā′shən), *n.* پژمین؛ پژمە.
**sternutator** (stûr′nyoo-tā´tĕr), *n.* ماددەیەکە کە دەبێتە هۆی

پژمین و ڕشانەوە (وەك گازی ژەهراوی).
**sternutatory** (stēr-nū′tə-tôr′i, stēr-nū′tə-tō′ri), *adj.* مرۆڤ هێنەرە پژمیر (وەك برنووتی).
*n.* شتێکە کە مرۆڤ دینێتە پژمین (وەك برنووتی و ئالەت).
**sternward** (stûrn′wẽrd), *adj. Also* sternwards, بەرەو پاشەڵی کەشتی.
*adj.* لە بەشی دواوەی کەشتی و بەلەمدا؛ لە پاشەڵی کەشتیدا.
**sternway** (stûrn′wā′), *n.* بۆ دواوە ڕۆیشتنی کەشتی.
**sternwheeler** (stûrn′hwēl′ẽr), *n.* بەلەمی چەرخدار بەلەمێکی هەڵمە بە چەرخێکی سەوڵ لێدەری بەستراو بە پشتەکەیەوە دەڕوات.
**steroid** (ster′oid), *n.* ستێرۆید: چەند جۆرە هۆرمۆنێکن بۆ لەش بەهێزکردن

**sterol** (ster′ōl, ster′ol), *n.* ماددەیەکی کحولی پتەوە لە شانەی ڕووەك و گیانداردا هەیە وەك کۆلیسترۆل.
**stertor** (stûr′tẽr), *n.* پرخە؛ پرخەپرخ
**stertorous** (stûr′tə-rəs), *adj.* پرخەکەر؛ پرخەپرخکەر.
**stet** (stet), [L], مەی گۆڕە: وەك خۆی بیهێڵەرەوە؛ دەستی لێ مەدە: نیشانەیەکە لە دەستنووسی هەڵەبڕکراودا دەنووسرێ بۆ هێشتنەوەی ووشەیەك یا بەندێکی لابراو یا بە هەڵە دانراو و چاك کراو.
*v.t.* دانانی نیشانەیەکی وەها لەسەر ووشە و ڕستە و بەندی دەستنووسی هەڵەبڕکراو
**stetho-** (steth′ō, steth′ə), پێشگرێکە بەمانای: سنگ؛ سینە:
*(stethoscope)*
**stethoscope** (steth′ə-skōp′), *n.* بیستۆکی پزیشك
**stethoscopy** (ste-thos′kə-pi), *n.* بیستۆکی پزیشك بەکارهێنان؛ تێڕوانینی نەخۆش بە بیستۆك
-stethoscopic; stethoscopical *(adj.)*; stethoscopically *(adv.)*.
**stevedore** (stē′və-dôr′, stē′və-dōr′), *n.* بارکەر و باردادگری کەشتی: حەماڵی کەشتی.
*v.t.* بارکردن و داگرتنی کەشتی.
**stevedore's knot,** گرێی حەماڵی کەشتی: جۆرە گرێیەکە.
**stew** (sto͞o, stū), *v.t. & v.i.* (١) کوڵاندن بە ئاگری کز، واتە بە هێواشی. (٢) [Colloq.]. دڵەڕاوکێ کردن؛ مەراق خواردن.
*n.* (١) (*pl.*) قەحبەخانە؛ کەللەچی.
(٢) (ا) چێشتی شلە؛ شلە؛ شلەو گۆشت. (ب) هەڕەمە؛ شتی تێکەڵ.
(٣) [Colloq.]. دڵەڕاوکێ؛ دڵەخورتە؛ مەراق؛ بێ ئارامی.
(٤) [Obs.]؛ مەنجەڵی شلە.
**stew in one's juice,** ناخۆشی زۆر چەشتن بەهۆی کاری خۆکردەوە.
**steward** (sto͞o′ẽrd, stū′ẽrd), *n.* (١) سەرکار؛ چاودێر؛ کارگێڕی کاروباری ماڵەوەی پیاوێکی گەورە. (٢) کارگێڕی دارایی کەسێك یا دەسگایەك. (٣) بەردەستی ناو فڕۆکە و کەشتی.

*v.i.* سەرکاری کردن؛ کارگێڕی کردن؛ چاودێری کردن.
**stewardess** (sto͞o′ẽr-dis, stū′ẽr-dis), *n.* (١) سەرکاری ئافرەت؛ کارگێڕی ژن. (٢) ئافرەتی بەردەستی ناو فڕۆکە و کەشتی.
**stewardship** (sto͞o′ẽrd-ship′, stū′ẽrd-ship′), *n.* سەرکارێتی؛ سەرکاری؛ چاودێری؛ کارگێڕی
**stewed** (sto͞od, stūd), *adj.* (١) کوڵاو؛ کوڵێنراو.
(٢) [Slang]. سەرخۆش؛ مەست.
**stew-pan** (stoo′pan′, stū′pan′), *n.* مەنجەڵی شلە
**sthenia** (sthi-nī′ə, sthē′ni-ə), *n.* بەتینی؛ بەهێزی
**sthenic** (sthen′ik), *adj.* بەتین (نەخۆشی)؛ بەتەشەنە
**stibine** (stib′ēn, stib′in), *n. Also* stibin, ئەستیبین: گازێکی بێ ڕەنگی ژەهراوییە

**stibium** (stib′i-əm), *n.* antimony.
**stich** (stik), *n.* دێڕە هەڵبەست.
**stichomythia** (stik′ə-mith′i-ə), *n.* گفتوگۆی یەك دێڕی بە نۆبەی دووکەسی (شانۆنامەی یۆنانی کۆن).
-stichomythic *(adj.)*.
**stichomythy** (sti-kom′ə-thi), *n.* – stichomythia.
**stick** (stik), *n.* (١) (ا) چیلکە؛ چڵ و چێو؛ چڵ؛ لق. (ب) داری سووتان. (ج) داردەست؛ دار؛ شووڵك؛ لیس؛ تێلا. (٢) لاسك.
(٣) شتێکی لە دار چوو. (٤) داری یاری: *(a hockey ~)*.
(٥) پیاکردن (بە تیغ یا داری نووك تیژ). (٦) لکان.
(٧) نەختێك خواردنەوەی سەرخۆشکەر (وەك براندی) کە بکرێتە خواردنەوەیەکەوە. (٨) ڕیزە بۆمبای هاوێژراو لە فڕۆکەوە.
(٩) [Archaic]. وەستان؛ کۆسپ.
(١٠) [Colloq.]، کەسێکی دڵ مردوو و ووشك و بێ تاقەت و کەودەن
(١١) (*pl.*)، [Colloq.]، شوێنێکی دوورەدەست و چەپەك؛ لادێ:
*(They live way out in the ~s.)*
(١٢) دارکەشتی.
*v.t.* (١) کون کردن؛ کون تێکردن. (٢) کوشتن (بە تیغ لێدان).
(٣) پیاکردن و کون کردن (بە چەقۆ، دەرزی... هتد).
(٤) (ا) پێوەنان؛ لێدان و پێوە نووساندن (وەك بە دەرزی)؛ پیاکردن
(ب) ڕازاندنەوە بە شت پیاکردن: *(a coat stuck with medals)*
(٥) پێوەلکاندن؛ پێوەنووساندن؛ پیانووساندن؛ لێدان:
*( ~ the poster on the wall.)*
(٦) پیاکردن؛ پیا چەقاندن
(٧) (ا) ڕێ لێگرتن؛ گلدانەوە؛ بەنگ کردن.
(ب) چەقین؛ گیرخواردن: *(The wheels were stuck in the mud.; I was stuck in the town.)*
(٨) [Colloq.]، تێخستن؛ دانان؛ خستنەناو:
*( ~ the shirt in the suitcase.; ~ it in the drawer.)*
(٩) [Colloq.]، سەر سوڕمان؛ سەرسام بوون؛ سەر لێ شێواندن.
(١٠) خستنەسەر دار یا پیا هەڵسپاردن (تەرزی ڕووەك).
(١١) شتی لینج لێدان؛ لینج کردن؛ سرێشاوی کردن.
(١٢) [Slang]، (ا) بە فڕوفێڵ پارە پێ خەرج کردن یا لێ کێشانەوە
(ب) بەگران شت پێ فرۆشتن؛ زۆر لێسەندن.
(١٣) [Slang]، (ا) خەڵەتاندن؛ گزی لێکردن؛ ساختەلێکردن.
(ب) باری گران بەسەرداداان.
(١٤) [Slang]، دەربردن؛ هەڵکردن؛ بەرگەگرتن.
*v.i.* (١) پێوەنووسان (وەك بە بزمار). (٢) پێوەلکان؛ پێوەنووسان.
(٣) مانەوە لە شوێنێکدا.
(٤) پێکەوە مانەوە؛ واز لە یەك نەهێنان: *(Friends ~ together.)*
(٥) بەجێ نەهێشتن؛ لێ دوورنەکەوتنەوە: *(He ~s to the trail.)*
(٦) کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان؛ بەردەوام بوون لەسەر:
*(She ~s to her work.)*
(٧) دوودڵی نەکردن؛ ڕا نەگۆڕین: *(He ~s to his decision.)*
(٨) (ا) چەقین: *(My shoe stuck in the mud.)*.
(ب) گیرخواردن؛ تێك ئالۆزان: *(The gears stuck.)*.
(ج) چەقین (مەجاز)؛ وەستان: *(The bill is stuck in committee.)*.
(٩) سەر سوڕمان؛ سەرسام بوون؛ سەر لێ شێوان
(١٠) سڵکردنەوە: *(He'll ~ at nothing.)*
(١١) ( ~ out ; ~ up )، سەر دەرهێنان؛ دەرپۆقین:
*(Her head was ~ing out of the window.)*
be stuck on, [Colloq.], (١) تێدا گیرخواردن.
(٢) گیرۆدەبوون (دڵداری)؛ دڵفڕان.
stick around, [Slang], دوور نەکەوتنەوە؛ مانەوە؛ نەڕۆیشتن
stick by, دەستبەردار نەبوون؛ پشت بەرنەدان:

*( to stick by one's friends )*

**stick it out,** [Colloq.], کۆڵنەدان؛ وازنەهێنان؛ دەست هەڵنەگرتن؛ بەرگەگرتن

**stick out,** (١) دەرپەڕین؛ زۆر بەدەرەوەبوون (٢) دەرهێنان؛ دەرپەڕاندن.

**stick up,** [Slang], بڕین (بانق، فرۆشگا)؛ ڕووتکردنەوە.

**stick up for,** [Colloq.], لەسەرکردنەوە؛ پشت گرتن:

*( You have to stick up for your friends.)*

**the sticks,** [Colloq.], لادێ؛ شوێنی دوورەدەست و چەپەك.

**sticker** (stik'ēr), *n.* (١) کەسێك یا شتێك کە پێوە دەنووسێ.

(٢) درك؛ پەیکوڵە. (٣) نیشانەی لینج (بۆ لکاندن بە ڕوویەکەوە).

(٤) کەسێکی کۆڵنەدەر؛ کەسێکی سوور لەسەر مەبەست؛ هەتەر.

(٥) [Colloq.]، گیروگرفت؛ تەنگوچەڵەمە.

**stickiness** (stik'i-nis), *n.* لینجی

**sticking plaster,** مشەمای لە پشت یا لە برین گرتن؛ پلاستەر.

**sticking point,** جێی چەقین (مەجان)؛ گیروگرفت؛ تەنگوچەڵەمە.

**stick insect,** چیلکە مێروو.

**stick-in-the-mud** (stik''n-*the*-mud´), *n.* [Colloq.], کەسێکی ووشك و کۆنەپەرست و دڵ مردوو.

**stickle** (stik''l), *v.i.* (١) مشت ومڕی کەللەڕەقانە کردن لەسەر شتی هیچ وپووچ. (٢) پەڵپی هیچ وپووچ گرتن؛ ڕاڕایی کردن یا ترسان لەبەر بەویژدانی.

**stickleback** (stik''l-bak´), *n.* ماسی‌یە درکنە. ماسی‌یەکی بچووکی بێ پوولەکەی پشت درکاوی دەریایی و ڕووباری‌یە.

**stickler** (stik'lēr), *n.* (١) کەسێکی شت زۆر بە توند گرتوو؛ سوور لەسەر مەبەست:

*( He is a ~ for discipline, obedience, etc.; a ~ for neatness )*

(٢) شتێکی قورس یا گیروگرفتاوی؛ شتی ئاڵۆز یا سەرسوڕمێنەر.

(٣) [Colloq.]، کەسێکی کۆڵنەدەر.

**stick-pin** (stik'pin´), *n.* دەرزی بۆینباخ.

**stick-seed** (stik'sēd´), *n.* پەیکوڵ. گیای پەیکوڵ گر.

**stick-tight** (stik'tīt´), *n.* گیایەکە بەرەکەی باریکە وەك دەرزی بە شتەوە دەنووسێ.

**stick-to-it-ive-ness** (stik´too'it-iv-nis), *n.* کۆڵ نەدان؛ هەتەری. سووربوون لەسەر مەبەست؛ وازنەهێنان.

**stick-up** (stik'up´), *n.* [Slang], = **holdup.**

**stick-weed** (stik'wēd'), *n.* = **ragweed.**

**sticky** (stik'i), *adj.* (١) سرنشاوی؛ پێوە دەلکێت؛ پێوەی دەنووسێت.

(٢) لیقن؛ لینج: *( a ~ floor)* .

(٣) بۆخە؛ شێدار (ئاووهەوا)؛ تەڕوگەرم.

(٤) (ا) ناخۆش. (ب) گیروگرفتاوی؛ دژوار؛ سەخت.

-**stickily** *(adv.)*; **stickiness** *(n.)*.

**stiff** (stif), *adj.* (١) (ا) ڕەق. (ب) ڕەپ؛ قنج.

(٢) بەگیروەستاو؛ ڕەق: *( ~ muscles )* .

(٣) کرژ. (٤) ووشك و بەفیز. (٥) توند؛ خەست؛ خەست وخۆڵ.

(٦) سوور لەسەر مەبەست؛ سەرسەخت؛ هەتەر؛ کۆڵنەدەر.

(٧) توند؛ بەهێز؛ قایم؛ تیژ: *( a ~ current, wind, etc.)* .

(٨) (ا) خەست (مەی). (ب) بەتین (دەرمان): *( a ~dose of medicine )* .

(٩) توندوتیژ؛ سەخت؛ قورس: *( ~ penalties )* .

(١٠) گران (ئەرك)؛ قورس؛ سەخت: *( a ~ assignment; a ~ climb )* .

(١١) گران (نرخ)؛ بەرز: *( ~ prices )*

*adv.* (١) بە ووشکی (ڕەووشت).

(٢) بەتەواوی؛ زۆر؛ نێجگار: *( bored ~ )* .

*n.* [Slang], (١) لاشە. (٢) کەسێکی ووشك وبەفیز.

(٣) کەسێکی مەست؛ سەرخۆش.

(٤) زەلام؛ کەس؛ کابرا؛ پیاو: *( He's a lucky ~ .)* .

(٥) ئاوارە؛ کەسێکی بێ لانە یا خانە بەکۆڵ؛ هەژاری گەڕۆك.

(٦) کەسێکی بەخشیش نەدەر؛ گیر.

-**stiffly** *(adv.)*; **stiffness** *(n.)*.

**stiffen** (stif''n), *v.t.* ڕەق کردن؛ توندوتیژکردن.

*v.i.* ڕەق بوون؛ بەگیروەستان.

**stiff-necked** (stif'nekt'), *adj.* کەللەڕەق؛ سەرسەخت.

**stifle** (stī'f'l), *v.t.* (١) خنکاندن؛ هەناسە لێ بڕین.

(٢) (ا) دامرکاندنەوە؛ خەفەکردن؛ کپ کردن: *( She ~d her sobs.)* .

(ب) پێشێل کردن؛ مراندن؛ ڕێ لێگرتن:

*( to ~ free speech, the opposition, etc.)*

*v.i.* (١) خنکان. (٢) هەناسە لێ بڕان.

**stifle** (stī'f'l), *n.* جومگەی پاشووی ئەسپ و سەگ... هتد، کە بەرامبەر بە ئەژنۆ وایە لە مرۆڤدا.

**stifling** (stī'fliŋ), *adj.* خنکێنەر؛ هەناسەبڕ؛ تەنگ؛ ناخۆش (هەوا، باری ژیان... هتد): *( The air was ~ .; a ~ atmosphere )*

**stigma** (stig'mə), *n.* (١) نیشانەی داخ کردن (کە لە پێستی تاوانکارو بەند ئەدرێت)؛ داخ. (٢) لەکە؛ نیشانەی شوورەیی یا ناوپیسی

(٣) خاڵ. (٤) (ا) نیشانەی بریتداری یا نەخۆشی کۆن.

(ب) شوێنی خوێن لێ هاتووی پێست (بەهۆی هیستیریاوە).

(٥) تەوقەسەری نێرك (ڕووەکناسی).

(٦) *(pl.)* ، نیشانەی وەك برینەکانی عیسا پاش هەڵواسینی.

**stigmata** (stig'mə-tə), *n.pl.* نیشانەی وەك برینەکانی عیسا پاش هەڵواسینی.

**stigmatic** (stig-mat'ik), *adj. Also* **stigmatical,** (١) (ا) لەکاوی؛ لەکەدار؛ ناوپیس. (ب) لەکەدارکەر؛ ناوپیسکەر.

(٢) تایبەتی بە " **stigmata** " .

**stigmatism** (stig'mə-tiz'm), *n.* (١) بە لەشەوە بوونی برینێك وەك برینەکانی عیسا پاش هەڵواسینی. (٢) باش بینی؛ تووش نەبوونی نەخۆشی پرش بینی چاو.

**stigmatize** (stig'mə-tīz´), *v.t.* (١) داخ کردن؛ نیشانەکردن بە داخ کردن. (٢) لەکەدارکردن؛ ناو پیس کردن؛ ڕووڕەش کردن.

(٣) برینی وەك برینەکانی عیسا لە پێست هێنان.

-**stigmatization** *(n.)*.

**stile** (stīl), *n.* (١) پلیکانەی دیوارو شوورە.

(٢) **turnstile** .

**stile** (stīl), *n.* چێوی ستوونی چوارچێوەی دەرگاو پەنجەرە.

**stiletto** (sti-let'ō), *n.* (١) خەنجەری بچووك. (٢) سووژن.

*v.t.* بە خەنجەر کوشتن؛ خەنجەرلێدان.

**still** (stil), *adj.* (١) بێ دەنگ؛ خامۆش؛ کپ.

(٢) وەستاو؛ نەبزۆك؛ نەجووڵاو؛ ڕاوەستاو.

(٣) هێمن؛ مەنگ (ئاو)؛ خامۆش: *( the ~ water of the lake)* .

(٤) بێ کەف وکوڵ (وەك مەی).

(٥) هی وێنەی نەبزۆك (بە پێچەوانەی وێنەی فیلمی سینەما و ڤیدیۆوە):

*( a ~ picture)*

*n.* (١) بێ دەنگی؛ خامۆشی؛ کپی.

(٢) وێنەی نەبزۆك (بە پێچەوانەی وێنەی فیلمی سینەما یا ڤیدیۆوە).

(٣) [Colloq.]، وێنەی شتی بێ گیان یا نەبزۆك.

(٤) [Colloq.]، **still alarm** .

*adv.* (١) هێشتا؛ تا ئێستا؛ تا ئەو(ئەم) کاتە؛ تا ئەوسا:

*( He is ~ busy.; Will he ~ be there?; She was ~ home when I left.)*

(٢) تەنانەت؛ – یش:

*( It was cold yesterday, but today it is ~ colder.)*

(٣) لەگەڵ ئەوەشدا؛ کەچی: *( He is old and ~ he is able to run.)*

*v.t.* (١) بێ دەنگ کردن؛ کپ کردن؛ خامۆش کردن.

(٢) وەستاندن؛ ڕاوەستاندن.
(٣) هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ هێنانەوە سەرخۆ.
***v.i.*** وەستان؛ ڕاوەستان؛ لە جووڵە کەوتن؛ دامرکاندنەوە؛ هێمن بوونەوە؛ بێ دەنگ بوون؛ خامۆش بوون.
**-stillness *(n.)*.**
**still** (stil), ***n.*** (١) شووشەی دڵۆپاندن؛ ئامێری دڵۆپاندن.
(٢) کارگەی دڵۆپاندن.
***v.t. & v.i.*** [Obs.], دڵۆپاندن
**still alarm,** ئاگادارکردنی بێ دەنگ: وورياکردنەوەيەکی ئاگر بەربوونەوەيە بە تەلەفۆن لەباتی زەنگی ئاگاداری ئاگر.
**still-birth** (stil'bûrth´), ***n.*** (١) ئاولەمە لەبارچوون؛ منداڵ لەبارچوون؛ بە مردوويی لەدايکبوونی منداڵ.
(٢) منداڵی بە مردوويی لەدايکبوو؛ ئاولەمەی لەبارچوو.
**still-born** (stil'bôrn´), ***adj.*** بە مردوويی لەدايکبوو؛ لەبارچوو.
**still-hunt** (stil'hunt´), ***v.t. & v.i.*** بە نهێنی ڕاوکردن يا شوێن کەوتن.
**still hunt,** (١) ڕاوکردنی نهێنی؛ ڕاوی دزی (وەك بە خۆ داگرتن).
(٢) [Colloq.]، شوێن کەوتنی نهێنی مەبەستێك؛ هەوڵی نهێنی.
**stilly** (stil'i), ***adj.*** [Poetic], بێ دەنگ؛ خامۆش؛ کپ؛ هێمن.
***adv.*** بە بێ دەنگ؛ بە خامۆشی؛ هێمنانە؛ بە هێمنی؛ لەسەرخۆ.
**stilt** (stilt), ***n.*** (١) دارشەقی درێژ (بۆ بە ئاودا پەڕینەوە يا بۆ ياری).
(٢) کۆڵەکە يا ديرەکی خانووی بە هەواوە، واتە کە لەسەر زەوی نەبێت؛ کۆڵەکەی شتی بە بەرزەوە دانراو:
***( The henhouse is placed on ~s.)***
(٣) باڵندەيەکی زەلکاوی لەنووك و لاق درێژە.
***v.t.*** بە بەرزەوە دانان لەسەر کۆڵەکە يا ديرەك.
**stilted** (stil'tid), ***adj.*** (١) بە بەرزەوە دانراو لەسەر کۆڵەکە يا تيرکە (خانووسازی). (٢) ووشەو پڕ لە ووشەی زل بۆ فيز (نووسين، گفتوگۆ)؛ بە تەنتەنە ***( a ~ writing style; ~ speech)*** .
**-stiltedly *(adv.)*; stiltedness *(n.)*.**
**stimulant** (stim'yoo-lənt), ***adj.*** خەبەروێن؛ وورياکەرەوە؛ بزوێنەر؛ ڕاخاوی مێشك دەرەوە؛ ووروژێنەر؛ هاندەر.
***n.*** (١) شتی وورياکەرەوە يا بزوێنەر؛ شتی هاندەر.
***( Coffee and beer are ~s.)***
(٢) دەرمانی ووروژێنەر يا بزوێنەر.
**stimulate** (stim'yoo-lāt´), ***v.t.*** (١) هاندان؛ بزواندن؛ جۆشدان؛ بووژاندنەوە؛ جموجووڵ تێخستن: ***( to ~ the economy)*** .
(٢) ووروژاندن (دەرمان)؛ هۆشيارکردنەوە؛ هەوەس هەڵساندن.
***v.i.*** بوون بەهۆی هاندان يا بزوان.
**-stimulater; stimulator *(n.)*.**
**stimulation** (stim´yoo-lā'shən), ***n.*** هاندان؛ بزوان؛ جۆشاندن؛ هۆشيارکردنەوە؛ هەوەس هەڵسان؛ ووروژان.
**stimulative** (stim´yoo-lā'tiv), ***adj.*** هاندەر؛ بزوێنەر؛ ووروژێنەر؛ وورياکەرەوە.
***n.*** شتی هاندەر يا بزوێنەر.
**stimulus** (stim'yoo-ləs), ***n.*** (١) بزوێنەر؛ هاندەر؛ هۆشيارکەرەوە؛ ووروژێنەر؛ هەوەس هەڵسێن؛ پاڵنەر. (٢) دەرمانی بزوێنەر يا هۆشيارکەرەوە.
**stimy** (stī'mi), ***n. & v.t.*** = stymie.
**sting** (stiŋ), ***v.t.*** (١) پێوەدان (جانەوەری چزوودار). (٢) چووزاندنەوە.
(٣) ئازاردان؛ ئێش و ئازاردان (هەست، مێشك):
***( Her words stung him bitterly.;***
***His conscience stung him sharply.)***
(٤) هاندان؛ پاڵ پێوەنان: ***( His words stung her into action.)*** .
(٥) [Slang]، خەڵەتاندن (سەوداگەری)؛ ساختەلێکردن؛ گزی لێکردن:
***( He got stung on that deal.)***

***v.i.*** (١) پێوەدان (جانەوەری چزوودار)؛ پياچوون (دڕك).
(٢) چووزانەوە؛ تووزانەوە؛ گڕ کردن:
***( Iodine ~s.; His leg stung from the nettles.)***
***n.*** (١) پێوەدان. (٢) توانای پێوەدان. (٣) هان؛ شتی هاندەر يا پاڵنەر
(٤) (ا) چووزانەوە؛ ئازاری پێوەدان.
(ب) ئێش و ئازار؛ ئازار (هەست، لەش):
***( the ~ of the wind, hunger, defeat, a whip, etc.)***
(٥) چزوو. (٦) دڕك.
**stingaree** (stiŋ'ə-rē´, stiŋ'ə-rē´), ***n.*** **= sting ray.**
**stinger** (stiŋ'ēr), ***n.*** (١) پێوەدەر؛ چووزێنەرەوە.
(٢) جانەوەری پێوەدەر (هەنگ، زەردەواڵە، دووپشك). (٣) چزوو.
(٤) [Colloq.]، (ا) ڕەخنەی هەست بريندارکەر؛ ووتەی بڕ.
(ب) لێدانی بە ئازار. (٥) جۆرێکە لە کۆکتێل يا خواردنەوەی مەستکەر.
**stinginess** (stin'ji-nis), ***n.*** پيسکەيی؛ گيری؛ پوولەکێتی؛ ڕەزيلی.
**sting-ray** (stiŋ'rā´), ***n.*** ڕای چزوودار: ماسیيەکی گەورەيە دوو چزووی ژەهراوی هەيە لە ژێر کلکيدا. (هەروەها " **stingaree** ") .
**stingy** (stin'ji), ***adj.*** (١) ڕەزيل؛ پارە پەرست؛ گير؛ دەست قووچاو؛ پوولەکی؛ ڕژد؛ چرووك؛ بەرچاوتەنگ.
(٢) کەم؛ کز: ***( A rain though ~ has began to fall.)*** .
**-stingily *(adv.)*.**
**stingy** (stiŋ'i), ***adj.*** پێوەدەر (جانەوەری چزوودار)؛ چووزێنەرەوە؛ بڕ؛ بە ئازار؛ توندوتيژ.
**stink** (stiŋk), ***v.i.*** (١) بۆگەن (لێ) هاتن؛ بۆنی پيس لێوەهاتن.
(٢) (ا) زۆر ناپەسەند يا بەدبوون. (ب) ناوبانگ زۆر خراپ بوون.
(٣) [Slang]، ئێجگار زۆر هەبوون: ***( He is ~ing with wealth.)*** .
(٤) [Slang]، زۆر خراپ يا گەندبوون: ***( The movie ~s.)*** .
***n.*** بۆگەن؛ بۆنی پيس.
**raise a stink,** [Slang], بۆڵەبۆڵ و سکاڵاکردن بە ئاشکرا؛ کردن بە هەرا.
**stink out,** قاندان؛ بە بۆنی پيس دەرپەڕاندنە دەرەوە.
**stinkard** (stiŋk'ērd), ***n.*** [Obs. or Rare], **= stinker.**
**stink-bug** (stiŋk'bug´), ***n.*** جانەوەری بۆگەن.
**stinker** (stiŋk'ēr), ***n.*** (١) کەسێکی بۆگەن.
(٢) [Slang]، کەسێکی زۆر پيس و بێ نرخ و ناڵەبار.
(٣) [Slang]، شتێکی زۆر قورس و ناخۆش:
***( The exam was a real ~ .)***
**stink-horn** (stiŋk'hôrn´), ***n.*** قارچکە بۆگەنە.
**stinking** (stiŋk'iŋ), ***adj.*** (١) بۆگەن.
(٢) [Slang]، زۆر مەست؛ زۆر سەرخۆش.
***adv.*** ئێجگار زۆر؛ زۆر: ***( He got ~ drunk.)*** .
**stinking smut,** نەخۆشیيەکی گەنمە لە " سن " دەچێ.
**stink-pot** (stiŋk'pot´), ***n.*** (١) کووپەلە بۆگەنە: گلێنەيەکی پڕ لە سووتەمەنی دووکەڵ بۆگەناوییە (جاران لە جەنگدا بەکاردەهێنرا).
(٢) [Slang]، کەسێکی بێ نرخی ناڵەبار.
**stink-stone** (stiŋk'stōn´), ***n.*** بەردەبۆگەنە: بەردێکە بۆنێکی پيسی لێ دێت ئەگەر بشکێنرێ يا دەستی لێ بخرێ.
**stink-weed** (stiŋk'wēd´), ***n.*** گيا بۆگەنە.
**stink-wood** (stiŋk'wood´), ***n.*** (١) درەختە بۆگەنە: درەختێکە دارو
**stinky** (stiŋ'ki), ***adj.*** بۆگەن.
**stint** (stint), ***v.t.*** (١) بۆ برينەوە (بەش، هەند، يا ژمارە بەتايبەتی کەم و نابەجێ)؛ سنوور بۆ دانان؛ کەم بۆ دانان.
(٢) [Archaic]، وەستاندن؛ دوايی پێ هێنان.
***v.i.*** (١) ڕەزيلی کردن؛ پيسکەيی کردن؛ چرووکی کردن:
***( Don't ~ on the food.; They ~ed for years in order to save money.)***

(٢) [Archaic]، وەستان؛ دوایی پێ هاتن.

*n.* (١) سنوور (هەند، ژمارە): *( to give without ~ )*.

(٢) هەند یا بەشی براوە؛ بەشی بەرکەوتوو یا بۆ دانراو: *( to exceed one's ~ )*

(٣) ئەرك: كاری پێ سپێردراو

(٤) [Obs.]، وەستان.

**stint** (stint), *n.* جۆرە باڵندەیەکی بچووکی کەنار دەریایە.

**stipe** (stīp), *n.* لاسك؛ قەف؛ قنچك.

**stipel** (stī′p'l), *n.* گونچکە گەڵای بچکۆلەی بن گەڵایەکی بچووك.

**stipend** (stī′pend), *n.* (١) مووچە (٢) پارەیەکە بۆ کەسێك براوەتەوەو ناوبەناو دەبدرێتێ (بەتایبەتی بۆ قوتابییەك)

**stipendiary** (stī-pen′di-er′i), *adj.* (١) مووچەخۆر؛ بۆ مووچە نیشکەر (٢) بە مووچە یا پارە کراو (ئیشوکار) (٣) مووچەیی.

*n.* کەسێکی مووچەخۆر.

**stipes** (stī′pēz), *n.* (١) قەف؛ لاسك؛ قنچك

(٢) بەشی دووەمی شەویلگەی سەرەوەی جانەوەرو گیانداری قاوغدار.

**stipple** (stip′'l), *v.t.* بە خاڵ خاڵ وێنەکێشان یا هەڵکەندن.

*n.* (١) شێوەی بە خاڵ خاڵ وێنەکێشان یا هەڵکەندن

(٢) ئەنجامی ئەم کارە؛ وێنەی بە خاڵ خاڵ کێشراو یا هەڵکەنراو.

**stipular** (stip′yoo-lẽr), *adj.* تایبەتی بە گونچکە گەڵا یا قنچکە بن گەڵای تر

**stipulate** (stip′yoo-lāt′), *v.t.* (١) خستنە پەیمانەوە؛ پەیماندان؛ بەڵێندان (لە پەیماندا) (٢) مەرج دانان

*v.i.* (١) مەرج دانان (٢) پەیمان بەستن.

**stipulate** (stip′yoo-lit, stip′yoo-lāt′), *adj.* گونچکە گەڵای بچووکدار، ووشەی " stipule " ببینە).

**stipulation** (stip′yoo-lā′shən), *n.* (١) مەرج دانان

(٢) پەیمان بەستن؛ بەڵێندان. (٣) مەرج.

**-stipulatory** *(adj.).*

**stipule** (stip′ūl), *n.* یەکێکە لە دوو گونچکە گەڵای بچووکی بن گەڵا یا لاسکەکەی

**stir** (stũr), *v.t.* (١) تێکدان بەتایبەتی بە ئەسپایی؛ تێکهەڵدان.

*( She ~ed the soup.)*

(٢) جووڵاندن: *( He ~ed the log.)*.

(٣) وورياکردنەوە؛ لەخەوهەڵساندن؛ بزواندن؛ خستنە جموجووڵ.

(٤) شڵەقاندن؛ تێکەڵاوکردن. (٥) هەست جووڵاندن

(٦) ( ~ up )؛ ووروژاندن؛ خستنە جۆش

*v.i.* (١) جووڵانەوە. *( The patient hasn't ~ed for an hour.)*.

(٢) هەڵسووکەوت کردن؛ جمان. (٣) روودان.

(٤) خرۆشان؛ ووروژان؛ هاتنەجۆش.

(٥) تێکدران؛ تێکەڵ بوون. *( The mixture ~s easily.)*.

*n.* (١) تێکدان؛ تێکهەڵدان

(٢) پشێوی؛ ئاشووب؛ هەراوزەنا؛ بەزم: *( The crowd was in a ~ .)*.

(٣) هاتنەجۆش؛ جۆش؛ ووروژان؛ جموجووڵ.

(٤) جووڵە

**-stirer** *(n.).*

**stir** (stũr), *n.* [Slang]. بەندیخانە

**stir crazy,** [Slang]. بێ ئارامی بەندیخانە یا بەسترانەوە؛ بێ سەرەوتی قەتیس بوون

**stirk** (stũrk), *n.* پارێن

**stirps** (stũrps), *n.* (١) بەرە؛ وەچە؛ نەوە؛ وەجاخ؛ بەرەباب.

(٢) باپیرەگەورەی هۆز یا بەرە.

**stirring** (stũr′iŋ), *adj.* (١) چالاك؛ گورج‌وگۆڵ؛ زیندوو؛ بزۆك.

(٢) ووروژێنەر؛ بزوێنەر؛ هاندەر. *( ~ music; a ~ call to arms)*.

**stirrup** (stũr′əp, stir′əp), *n.* (١) ئاوزەنگی

(٢) شتێکی وەك ئاوزەنگی.

**stirrup bone, = stapes.**

**stirrup cup,** (١) کاسەی ئاوزەنگی؛ پەرداخێك مەیە سوار دەیخواتەوە پێش ڕۆیشتنی. (٢) کاسەی خواحافیزی؛ بادەنۆشی خواحافیزی.

**stirrup leather,** قایشی ئاوزەنگی.

**stitch** (stich), *n.* (١) تەقەڵ. (٢) گرێ قوڵف؛ گرێ؛ قوڵفەی بە تەقەڵ کراو. (٣) تەقەڵی تایبەتی. (٤) ئازارێکی لە پڕو تیژی کەلەکە یا پشتە؛ لانێشە (٥) [Colloq.]، ئەختێ؛ تۆزێ؛ تۆسقاڵ؛ هیچ:

*( He hasn't done a ~ of work.)*

*v.i.* تەقەڵ لێدان؛ دوورینەوە؛ دوورین.

*v.t.* (١) دوورین؛ تەقەڵ لێدان؛ دوورینەوە. (٢) لێکدان.

**stitch-wort** (stich′wũrt′), *n.* چەند جۆرە گیایەکی نزمو گوڵ سپیو ئەستێرەیین.

**stithy** (stith′i, stith′i), *n.* (١) دەزگا؛ دەسکا.

(٢) دووکانی ئاسنگەر؛ ئاسنگەرخانە.

**stiver** (stī′vẽr), *n.* (١) ستایڤەر: پارەیەکی هۆڵەندی کەم نرخە.

(٢) شتێکی کەم نرخ یا هیچ‌وپووچ؛ ئەختێك.

**stoa** (stō′ə), *n.* داڵانی پایەدار؛ ڕارەوی سەرگیراوی پایەدار.

**stoat** (stōt), *n.* گیاندارێکە لە توخمی دەڵەك.

**stoccado** (sto-kä′dō), *n.* [Archaic], *Also* **staccata,** پیاکردن یا لێدان (تیغێکی نووك تیژ وەك شیر).

**stock** (stok), *n.* (١) قەد (درەخت).

(٢) [Archaic]، (ا) کۆتەرە؛ بنکەدار؛ پاشماوەی قەدی دار پاش برینەوەی. (ب) مووروەدار؛ برەدار؛ کۆتەرەدار. (٣) (ا) کەسێکی دەبەنگ یا گەلحۆ (ب) شتێکی مردوو یا بێ هەست. (٤) (ا) ئەو قەدی درەخت یا ڕووەکە کە بە موتوربە دەکرێ. (ب) ئەو ڕووەکەی قەلەمی لێ دەکرێتەوە. (٥) rhizome

(٦) چەند جۆرە ڕووەکێکن لە توخمی خەرتەلە. (٧) (ا) باپیرە گەورە.

(ب) وەچە؛ بەرە؛ نەوە. (ج) توخم. (د) ڕەگەز؛ نەتەوە.

(هـ) کۆمەڵە زمانی هاوبنچینە. (٨) بنکە یا سنگی دەزگای ئاسنگەر

(٩) (ا) دەسکی قامچی و داری ڕاوەماسی. (ب) چوارچێوەی ڕەندە

(ج) هەوجار. (د) قۆناغە تفەنگ.

(١٠) (*pl.*) ، ئامێرێکی سزادانی کۆنە بریتییە لە چوارچێوەیەك کە پێی تاوانکاری تێدا دەبەسترایەوەو هەندێك جاریش دەست‌و مەچەکیشی.

(١١) (*pl.*) ، چوارچێوەی کەشتی لەسەر دروستکردن.

(١٢) (ا) کەرەسەی خاو: *( paper ~ )*.

(ب) گۆشتاو (کە چێشتی پێ لێ دەنرێ).

(١٣) (ا) وواڵخ‌و کەرەسەو مەکینەی کێڵگەیەك.

(ب) مەڕوماڵات؛ ئاژەڵ؛ گاوگۆتاڵ.

(ج) سەرجەمی کەلوپەلی فرۆشگایەك یا عەمارێك.

(د) بەشی دەستە کاغەزی نەدراوی یاری.

(١٤) (ا) سەرمایەی بەسوود هێنراوی کۆمپانیای پارەبازی.

(ب) بەشی خاوەن بەشی کۆمپانیایەکی وەها. (ج) قەواڵەی ئەم بەشە

(١٥) (ا) هەڵسەنگان. (ب) بایەخ؛ بڕوا؛ بایەخ پێدان:

*( I put little ~ in his testimony.)*

(١٦) تیپی شانۆنامەی نیشتەجێ. (١٧) ملپێچی قەشە.

*v.t.* (١) قۆناغە تفەنگ بۆ دروستکردن؛ هەوجار بۆ کردن.

(٢) (ا) ڕەشەووڵاخ‌و مەڕوماڵات پەیداکردن‌و هێنان بۆ کێڵگەیەك.

(ب) فرۆشگا پڕکردن لە فرۆتەنی.

(٣) ئازووقەخستن؛ عەمارکردن؛ شتومەك خستنە دووکانەوە بۆ کڕیار؛ هەڵگرتن.

(٤) (ا) وێنجەو سێپەرەو گیا چاندن. (ب) لەوەڕاندن.

(٥) [Obs.]، خستنە چوارچێوەوە بۆ سزادان.

*v.i.* (١) تەرز فڕێدان.

(٢) ( ~ up )، ئازووقەخستن؛ عەمارکردن بۆ دواڕۆژ؛ کەڵەکەکردن.

*adj.* (١) هەمیشە دەست دەکەوێ (فرۆتەنی)؛ هەمیشە لە عەماردا هەیە:

*( ~ items; ~ sizes in shoes)*

(٢) ئاسایی؛ هەمیشە بەکاردەهێنرێت؛ شتێکی تازە نییە؛ کۆن و هیچ‌وپووچ؛ پەڕپووت
***( a ~ joke, argument, speech, remark, comparison)***
(٣) تایبەتی بە تیپی شانۆگەری نیشتەجێ.
(٤) هی زاوزێ؛ بۆ زاوزێیە: ***( a ~ mare )*** .
(٥) بۆ بەخێوکردنی مەڕومالاتە؛ تایبەتی بە ئاژەڵ بەخێوکردن:
***( ~ farming)***
**in stock,** هەیە لە فرۆشگادا؛ دەست دەکەوێ بۆ کڕین و فرۆشتن.
**on the stocks,** لە دروستکردندایە (کەشتی).
**out of stock,** لە فرۆشگادا نەماوە؛ دەست ناکەوێ بۆ کڕین و فرۆشتن؛ تەواو بووە؛ نەماوە.
**take stock,** (١) بەسەرکردنەوەی کەلوپەلی فرۆشگا. (٢) هەڵسەنگاندن.
**take stock in,** (١) بەش کڕین لە کۆمپانیایەکدا (پارەبازی).
(٢) [Colloq.]، بایەخ پێدان؛ بڕوا پێ بوون.

**stockade** (sto-kād′), *n.* (١) سەنگەر (کە بریتی بێ لە تەیمانێک کە لە شیشە داری داچەقیو پێکهاتبێ). (٢) پەچە. (٣) گرتوخانەی تەیمان کراو.
***v.t.*** تەیمار کردن؛ بە تەیمان دەورگرتن یا پاراستن؛ بە شیش دار دەورگرتن.

**stock-broker** (stok′brō′kēr), *n.* دەلاڵی پارەبازی.
**stock-brokerage** (stok′brō′kēr-ij), *n.* دەلاڵخانەی پارەبازی.
**stock car,** (١) فارگۆنی ئاژەڵ: فارگۆنێکی شەمەندەفەرە بۆ گواستنەوەی ئاژەڵ (٢) ئوتومبیلی ئاسایی گۆڕاو بۆ پێشبڕکێ.
**stock certificate,** قەواڵەی بەش لە کۆمپانیای هاوبەشی.
**stock company,** (١) کۆمپانیای هاوبەشی.
(٢) تیپی شانۆگەری نیشتەجێ.
**stock dove,** کۆترە کێویلە؛ کۆتری دەشتەکی؛ کۆترە باریکە.
**stock exchange,** بازاڕی پارەبازی؛ بۆرسە؛ بازاڕی ئاڵوگۆڕی بەشی کۆمپانیای هاوبەش.
**stock farm,** ئاژەڵگە؛ پەروەردگای ئاژەڵ.
**stock fish,** ماسی وشک کراوەی خوێ نەکراو.
**stock-holder** (stok′hōl′dēr), *n.* (١) بەشداری کۆمپانیای هاوبەش؛ خاوەن بەشی کۆمپانیای هاوبەش.
(٢) خاوەن ئاژەڵ؛ ئاژەڵ بەخێوکەر؛ شوان؛ گاوان.
**stockinet** (stok′i-net′), *n.* کاڵای گۆرەوی و دەرپێ.
**stocking** (stok′iŋ), *n.* (١) گۆرەوی درێژ؛ گۆرەوی.
(٢) شتێکی وەک گۆرەوی.
**in one's stocking feet,** بە گۆرەوییەوە؛ بە گۆرەوی لە پێدابوونەوە؛ بەبێ پێڵاو.
**stock-in-trade,** (١) کەلوپەلی فرۆشگا. (٢) کەرەسەی پیشەسازی.
(٣) کەرەسەی جێبەجێکردنی کارێک.
**stockish** (stok′ish), *adj.* گەلحۆ؛ گەلۆر؛ کەردەن؛ بێ مێشک؛ کەر.
**stock-jobber** (stok′job′ēr), *n.* دەلاڵی بازاڕی پارەبازی (هەندێک جار لەڕووی سووکییەوە).
**stockman** (stok′mən, stok′man′), *n.* (١) خاوەن ئاژەڵ؛ ئاژەڵ بەخێوکەر؛ شوان؛ گاوان. (٢) کارگەری عەمار.
**stock market,** (١) بازاڕی پارەبازی. (٢) ئاڵوگۆڕی بازاڕی پارەبازی.
(٣) نرخی بەشی کۆمپانیای هاوبەشی (لە بازاڕی پارەبازیدا).
**stockpile** (stok′pīl′), *n.* ئازووقە؛ شتی عەمارکراو (خواردەمەنی، کەلوپەل، حبەخانە، چەک، دەرمان... هتد).
***v.t. & v.i.*** کەڵەکەکردن؛ عەمارکردن؛ ئازووقەخستن.
**stockpot** (stok′pot′), *n.* (١) مەنجەڵی گۆشتاو.
(٢) دەفری شتی هەڕەمە.
**stockroom** (stok′rōōm′, stok′room′), *n.* عەمار گەنجینە.
**stocky** (stok′i), *adj.* تۆکمە تێکسمراو؛ کورت و ئەستوورو پڕ (مرۆڤ، گیاندار، ڕووەک)
-stockiness *(n.).*
**stockyard** (stok′yärd′), *n.* پەچە (بەتایبەتی بۆ ڕاگرتنی سەردەمی جەڵەبی ئاژەڵ و گاوگۆتاڵ و ئەسپ پێش سەربڕینیان یا فرۆشتنیان).
**stodgy** (stoj′i), *adj.* (١) قورس و ناخۆش (خواردەمەنی).
(٢) تۆکمە؛ تێکسمراو؛ قەبە. (٣) پڕ؛ سیخناخ؛ ئاخنراو.
(٤) وشک و ناخۆش: ***( a ~ book, novel, lecture, etc.)***
-stodgily *(adv.)*; stodginess *(n.).*
**stogie, stogy** (stō′gi), *n.* (١) ستۆجی: سیگارێکی باریک و درێژو هەرزانبەهایە. (٢) پێڵاو یا جزمەیەکی قورسە.
**Stoic** (stō′ik), *n.* (١) پەیڕەوی فەلسەفەیەکی یۆنانی کۆنە کە دەڵێت: ڕووداوەکانی ژیان هەمووی لەسەر ویستی خودایەودەبێ مرۆڤ بە بەجەرگانە شانی بداتە بەر بەبێ ئەوەی خۆشی و ناخۆشی کاری تێ بکات
(٢) [s-]، کەسێکی بێباک یا بەجەرگ؛ بەرگەگری ناخۆشی.
***adj.*** بێباک؛ بەجەرگ؛ بەرگەگر (ناخۆشی).
**stoical** (stō′i-k'l), *adj.* بێباک؛ بەجەرگ؛ بەرگەگر (ناخۆشی)؛ دەربڕدوو.
-stoically *(adv.).*
**stoichiometry** (stoi′ki-om′ə-tri), *n.* زانستی پێوانی یەککرتنی کیمیایی.
**Stoicism** (stō′i-siz'm), *n.* (١) فەلسەفەیەکی یۆنانیی کۆنە دەڵێت: دەبێ مرۆڤ بە بەجەرگانە شان بداتەبەر ڕووداوەکانی ژیان و خۆشی و ناخۆشی هیچ کاری تێ نەکات. (٢) [s-]، بێباکی؛ بەجەرگی؛ بەرگەگرتن (ناخۆشی).
**stoke** (stōk), *v.t. & v.i.* (١) ئاگر خۆش کردن؛ ئاگر جۆشدان.
(٢) سەرەوکاری توون یا ئاگردان کردن.
**stokehold** (stōk′hōld′), *n.* ژووری ئاگر لێوە خۆش کردنی توون و بەرمیلی ئاو کوڵاندنی کەشتی.
**stokehole** (stōk′hōl′), *n.* (١) (ا) دەرگای توون یا ئاگردان.
(ب) بەردەمی دەرگای توون یا ئاگردان. (٢) **stokehold** .
**stoker** (stōk′ēr), *n.* (١) توونچی (کەشتی)؛ ئاگر خۆشکەر.
(٢) ئامێری خەڵووز کردنە توون یا ئاگردانەوە.
**stole** (stōl), *n.* (١) کراسی ئاودامانی دەڵبی ژن (لە ڕۆمای کۆندا).
(٢) پارچە تەنراوێکی درێژی نەقشاوییە قەشە دەیدات بەسەر شانێک یا هەردوو شانیدا لەکاتی بەرنوێژی کردندا. (٣) کۆڵوانە.
**stole** (stōl), *past tense of* **steal.**
**stolen** (stōl′ən), *past participle of* **steal.**
**stolid** (stol′id), *adj.* بێ هەست؛ هەست مردوو
-stolidity; stolidness *(n.)*; stolidly *(adv.).*
**stolon** (stō′lon), *n.* (١) تەرزنکە بەسەر زەویدا دەخشێ و ڕەگ دادەکوتێ و دەبێتە ڕووەکێکی سەربەخۆ. (٢) پەلی هەندێ گیانداری وەک شیلانە کە بەچکەی تازەی لێ دەبێتەوە.
**stoma** (stō′mə), *n.* (١) کونیلەی پێستی هەندێ ڕووەک (بۆ هەناسەدان).
(٢) کونیلەیەکە لە گیانداری سەرەتاییدا ئیشی دەم دەبینێ.
**stomach** (stum′ək), *n.* (١) گەدە. (٢) وورگ؛ سک.
(٣) ئارەزووی خواردن.
(٤) ئارەزوو ***( They had no ~ for fighting.)*** .
(٥) [Obs.]، ئازایی؛ پرکێشی؛ نەترسان؛ بەجەرگی.
(٦) [Obs.]، لووت بەرزی؛ فیز.
***v.t.*** (١) خواردن؛ هەرس کردن؛ توانای خواردن و هەرس کردن هەبوون.
(٢) چاوپۆشی کردن؛ خۆگرتن؛ دان بە خۆدا گرتن؛ گوێ پێ نەدان؛ دەبردن لەگەڵدا: ***( He cannot ~ cruelty to animals.; She cannot ~ him.)***
(٣) [Obs.]، پێ ناخۆش بوون؛ تووڕەبوون؛ قین لێ بوونەوە.
**stomach-ache** (stum′ək-āk′), *n.* سک ئێشە.
**stomacher** (stum′ək-ēr), *n.* تەنراوێکی نەقشاوی یا خشڵاوی جوانە جاران ژن لەبەریان دەکرد بەسەر سنگ و سکیاندا لەسەر بەرگی ترەوە.
**stomachic** (stō-mak′ik), *adj. Also* **stomachal,** (١) گەدەیی

(٢) یارمەتی هەرس کردن دەدات؛ بۆ هەرس باشە؛ بۆ گەدە باشە.
**n.** دەرمانی هەرس؛ دەرمانی گەدە.
-stomachical *(adj.)*.
**stomach pump,** ترومپای گەدە (بۆ هەڵهێنجانی خواردەمەنی ناو گەدە لە ئەنجامی ژەهر لێدانا... هتد).
**stomata** (stō′mə-tə, stom′ə-tə), ***n.*** *plural of* **stoma.**
**stomatal** (stom′ə-t'l, stō′mə-t'l), ***adj.*** کونیلەیی؛ کونیلەدار. (ووشەی " stoma " ببینە).
**stomatic** (stō-mat′ik), ***adj.*** (١) دەمی؛ تایبەتی بە دەم.
(٢) کونیلەیی. (ووشەی " stoma " ببینە).
**stomatitis** (stō′mə-tī′tis, stom′ə-tī′tis), ***n.*** هەوکردنی دەم.
**stomato-** (stom′ə-tō, stō′mə-tə), پێشگرێکە بەمانای: دەمی؛ دەم؛ تایبەتی بە دەم: ( *stomatology* ).
**stomatology** (stō′mə-tol′ə-ji), ***n.*** زانستی دەمو نەخۆشییەکانی.
**stomatopod** (stom′ə-tō-pod′), ***n.*** گیانداری پێ دەمی: چەند جۆرە گیاندارێکی ئاوی قاڵەدارن پەلەکانیان کونیلەی وەك دەمی پێوەیە.
**stomatous** (stom′ə-təs, stō′mə-təs), ***adj.*** کونیلەدار. (ووشەی " stoma " ببینە).
**stomodaeum, stomodeum** (stō′mə-dē′əm), ***n.*** دەمی ناوئەمە
**stomp** (stomp), ***n., v.t. & v.i.*** [Dial.], = **stamp.**
**-stomy,** پاشگرێکە بەمانای: کون کردنە ئەندامێك بە نەشتەرکاری.
**stone** (stōn), ***n.*** (١) بەرد؛ کوچك. (٢) (ا) بەردی خانوو.
(ب) بەردی چەخماخچی؛ هەستان. (ج) کێلەبەرد. (د) تەختەبەرد.
(٣) شتێکی بەرد ئاسا: (ا) تەرزە. (ب) گون. (ج) ناوکە خورما و قۆخ.
(٤) بەردی بەنرخ. (٥) کێشێکی ئینگلیزییە بریتییە لە چواردە پاوەند.
(٦) بەردی گورچیلە.
(٧) مێزێکی سەر لووس و بەردینە تیپی چاپەمەنی لەسەر ڕێك دەخرێ.
***v.t.*** (١) بەردەباران کردن؛ بەرد پیادان؛ بە بەرد کوشتن.
(٢) تەختەبەرد کردن؛ بەردڕێژکردن. (٣) هەستان لێدان؛ تیژکردن (بە زبرە یا هەستان). (٤) ناوك لێ دەرهێنان (قۆخ، گێلاس، خورما).
(٥) [Obs.]، ڕەق کردن؛ وەك بەرد لێکردن.
***adj.*** (١) بەردین؛ بەرد: ( *a ~ wall* ).
(٢) گلێنە.
**cast the first stone,** یەکەم بەرد هاویشتن؛ یەکەم کەس بوون لە ڕەخنەگرتن، سەرزەنشتی کردن، یا هێرش بردندا.
**leave no stone unturned,** هەموو هەوڵێك دان؛ زۆر هەوڵدان؛ بە هەموو جۆرێك هەوڵدان.
**stone-** (stōn), پێشگرێکە بەمانای: زۆر؛ بەتەواوی: ( *stone-blind* ).
**Stone Age,** دەوری بەرد؛ چەرخی بەردین.
**stone-blind** (stōn′blīnd′), ***adj.*** کوێری تەواو.
**stone-broke** (stōn′brōk′), ***adj.*** [Slang], نابووتی تەواو؛ مایە پووت.
**stone-chat** (stōn′chat′), ***n.*** جۆرە باڵندەیەکە لە توخمی ڕیشۆلە.
**stone-crop** (stōn′krop′), ***n.*** = **sedum.**
**stone-cutter** (stōn′kut′ẽr), ***n.*** (١) بەردتاش
(٢) ئامێری بەرد تاشین یا ڕێكوپێك کردن.
**stone-deaf** (stōn′def′), ***adj.*** کەڕی تەواو؛ کەڕ.
**stone-fruit,** میوەی ناوکدار (قۆخ، گێلاس).
**stone marten,** (١) دەڵەك. (٢) پێستە دەڵەك.
**stone-mason** (stōn′mā′s'n), ***n.*** بەردتاش؛ بەنا؛ بیناساز.
-stonemasonry *(n.)*.
**stone parsley,** سەوزەیەکی بۆن خۆشە لە توخمی مەعدەنووس دەکرێتە چێشتەوە
**stone's throw,** بەرداوێژ؛ بەردهاوێژ؛ ماوەیەکی زۆر نزیك.

**stone-wall,** ***n.*** (١) کەڵەك؛ شوورەی کەڵەك (بە دەوری زەوییەکدا).
(٢) کۆسپ؛ کەندوکۆسپ.
**stone-wall,** ***v.i. & v.t.*** کۆسپ لە ڕێگەدا دانان؛ خۆ بەدەستەوە نەدان؛ خۆدزینەوە (لە پرسیارێك)؛ هاوکاری لەگەڵ نەکردن.
**stone-ware** (stōn′wâr′), ***n.*** گلێنەی بەردین؛ دەفری گلێنەی سوورەوەکراو.
**stone-work** (stōn′wũrk′), ***n.*** (١) بەردتاشی؛ بەردبڕی؛ بەردکاری.
(٢) خانووی بەرد؛ دیواری بەرد؛ بەشی بەردینی خانوو:
*( The first storey is ~ .)*
(٣) (*pl.*)، شوێنی بەردتاشین.
-stone-worker *(n.)*.
**stone-wort** (stōn′wũrt′), ***n.*** قەوزەی ناو بەرد (کە گەلێك جار گەچاوییە).
**stony** (stō′ni), ***adj.*** (١) بەردەڵانی؛ بەردانی؛ بەردەڵان. (٢) ڕەق.
(٣) دڵڕەق؛ بێ بەزەیی.
(٤) بێ هەست؛ سارد؛ هەست مردوو: ( *a ~ face* ).
(٥) تۆقێنەر؛ سڕکەر: ( *a ~ fear* ).
(٦) [Poetic]، بەردین.
-stonily *(adv.)*; stoniness *(n.)*.
**stony-hearted** (stō′ni-här′tid), ***adj.*** دڵڕەق؛ بێ بەزەیی.
**stood** (stood), *past tense and past participle of* **stand.**
**stooge** (stōōj), ***n.*** (١) قەشمەر: نوێنەرێکە کە دەبێتە دەسکەلای نوێنەرە سەرەکییەکە بۆ پێکەنین. (٢) دەسکەلا؛ نۆکەر؛ کەسێکی بەکارهێنراو لەلایەن کەسێکی ترەوە. (٣) سیخوڕ؛ جاسووس.
***v.i.*** [Colloq.], بوون بە قەشمەر؛ بوون بە دەسکەلا؛ بوون بە سیخوڕ.
**stook** (stōōk, stook), ***n.*** [British], مەلۆ.
**stool** (stōōl), ***n.*** (١) ئەسکەمل؛ ئەسکەملی؛ کورسی بێ پشت.
(٢) ئاودەستخانە؛ ئاودەست. (٣) گووکردن. (٤) گوو؛ پیسایی
(٥) کۆتەرەداری چووز دەرکردوو؛ ڕەگی چووز دەرکردوو.
(٦) چەپکە چووزێکی وەها. (٧) تەڵە؛ داو.
(٨) باڵندەی ڕاو (وەك کەوو سوێسکە).
***v.i.*** (١) چووز دەرکردن (کۆتەرەدار). (٢) گووکردن؛ پیسایی کردن.
(٣) [Colloq.]، سووسەیی کردن؛ سیخوڕی کردن.
**stool pigeon,** (١) کۆتری ڕاو: باڵندەیەکە وەك کەوو سوێسکە کە بۆ ڕاو بەکاردەهێنرێت. (٢) کەسێکە وەك داو خەڵکی پێ دەگیرێ.
(٣) [Colloq.]، سیخوڕ؛ جاسووس.
**stoop** (stōōp), ***v.i.*** (١) چەمینەوە؛ دانەوینەوە؛ کۆمانەوە؛ خۆ نوشتانەوە.
(٢) شان داچەکان.
(٣) خۆ نزم کردنەوە (ڕەووشت)؛ خۆ سووك کردن:
*( He ~ed to begging and stealing.)*
(٤) [Rare]، ملکەچ کردن؛ کڕنووش بردن.
(٥) شاڵاوبردن (باڵندەی گۆشتخۆر)؛ لەپڕ بەسەردا دان.
***v.t.*** (١) چەماندنەوە؛ نوشتاندنەوە.
(٢) [Archaic]، نزم کردنەوە (ڕەفتار)؛ سووك کردن.
***n.*** (١) نوشتانەوە؛ چەمینەوە. (٢) شان داچەکان.
(٣) خۆ سووك کردن؛ نزمی؛ نزم بوونەوە (ڕەووشت).
(٤) ملکەچی؛ کڕنووش. (٥) شاڵاو (باڵندەی گۆشتخۆر).
**stoop** (stōōp), ***n.*** (١) سەکۆی پێ پێلکەداری بەردەرگا.
(٢) داڵانی بەردەرگا.
**stoop** (stōop), ***n.*** = **stoup.**
**stop** (stop), ***v.t.*** (١) گرتنەوە (خوێن، شلە، ئاو)؛ وەستاندن.
(٢) بەرگرتن؛ بەردەم گرتن؛ ڕێگرتن؛ بەربەستکردن.
(٣) پڕکردنەوە (کون، کەلێن)؛ گرتن (کون).
(٤) سەرنانەوە (شووشە)؛ داخستن (دەفر، شووشە)؛ دەم نانەوە
(٥) (ا) پەنجە خستنەسەر کونی ئامێری مۆسیقای فووپیاکەر.

(ب) ئاوازێکی تایبەتی لێدان بەم داخستنە.
(٦) وەستاندن؛ ڕێ لێگرتن؛ ڕاگرتن؛ ڕێ نەدان؛ ڕێی ڕۆیشتن نەدان؛ ڕاوەستاندن؛ دەست هێنانە ڕێ.
(٧) (ا) بەرهەڵستی کردن. (ب) بەزاندن؛ بۆڕپێدان. (ج) ئامەگرتن.
(٨) وەستان: ***( He ~ed talking.)***:
(٩) براندنەوە؛ بڕینەوە؛ دوایی پێ هێنان: ***( ~ that noise.)*** .
(١٠) وەستاندن (مەکینە)؛ کوژاندنەوە.
(١١) دەست نان بە ژێی کەماندا (بۆ لێدانی ئاوازێکی تایبەتی).
(١٢) خاڵبەندی کردن (ڕێزمان).
(١٣) وەستاندن (کار)؛ ڕێ لێگرتن (مرۆڤ لە کردنی شتێك)؛ نەهێشتن.
(١٤) وەستاندنی گۆڕینەوەی چەك: ***( He asked the bank to ~ payment on the check.)***

***v.i.*** (١) وەستان (جووڵە). (٢) وەستان (کار)؛ وازلێهێنان.
(٣) وەستان (مەکینە)؛ کوژانەوە. (٤) بەرگیران (بۆری، ئاوەڕۆ... هتد)؛ گیران؛ بەر بەستران؛ پەنگخواردنەوە. (٥) گل خواردنەوە؛ ڕاوەستان؛ مانەوە؛ لادان.

***n.*** (١) وەستان؛ ڕاوەستان. (٢) کۆتایی؛ دوایی؛ دوایی هاتن.
(٣) لادان (گەشت)؛ مانەوە؛ ڕاوەستان؛ گلخواردنەوە. (٤) وێستگە (پاس).
(٥) دەمەوانە؛ پلاك. (٦) داوای وەستانی چەك لەلایەن خاوەنەکەیەوە بۆ نەگۆڕینەوەی لەلایەن بانقەوە. (٧) خاڵ (خاڵبەندی)
(٨) (ا) پەنجە خستنەسەر کونی ئامێرێکی فووپیاکەر بۆ لێدانی ئاوازێکی تایبەتی (ب) کونێکی پەنجە خراوەسەر.
(٩) (ا) وەستانی هەوا لە بێژانی هەندێ تیپدا (دەنگناسی).
(ب) تیپێکی وەها (وەك: **d, t, g, k, b, p** ).

**put a stop to,** وەستاندن؛ کۆتایی پێ هێنان؛ بڕینەوە؛ ڕاوەستاندن.

**stop off,** وەستان لە شوێنێك بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر ڕێگادا بۆ شوێنێکی تر؛ لادان:
***( I stopped off at her house on my way to the store.)***

**stop over,** (١) مانەوە بۆ ماوەیەك. (٢) لادان لەکاتی گەشتدا بۆ پشوودان؛ مانەوە یا وەستان لە بەینی دوو قۆناغە ڕێدا؛ بارخستن:
***( Are you going to stop over in Europe on your way home? )***

**stopcock** (stop′kok′), ***n.*** بەلووعە؛ قفڵی ئاو یا شلەی تر.

**stope** (stōp), ***n.*** چاڵی پێ پیلکەیی کانگا.

***v.t. & v.i.*** کانزای خاو دەرهێنان لە چاڵێکی وەها.

**stop-gap** (stop′gap′), ***n.*** چارەی سەردەمی؛ بریکاری سەردەمی:
***( ~ measures, solutions, etc.)***

**stop light,** (١) چرای وەستانی هاتوچۆی ئوتومبیل لە ڕێگەوباندا (کە سوورە) (٢) چرای وەستانی پشتی ئوتومبیل (کە دادەگیرسێت بە پێنان بە وەستێنەردا)

**stop order,** فەرماندان بە دەڵاڵی پارەبازی بە کڕین یا فرۆشتنی بەشی کەسێك یا کۆمپانیایەك بە نرخێکی تایبەتی.

**stop-over** (stop′ō′vēr), ***n.*** (١) لادان لە کاتی گەشتدا بۆ پشوودان؛ وەستان یا لادانی بەینی دوو قۆناغە ڕێدا؛ بارخستن.
(٢) شوێنی ئەم لادان یا وەستانە.

**stoppage** (stop′ij), ***n.*** (١) وەستان؛ وەستێنران؛ ڕاوەستان.
(٢) بەرگیران (شلە)؛ گیران (بۆری)؛ بەردەم داخران.

**stop payment,** چەك ڕاگرتن: فەرمانێکە لە خاوەن چەکەوە بۆ بانق بۆ نەگۆڕینەوەی چەکێك کە ئیمزای خۆیی پێوە بێ.

**stopper** (stop′ēr), ***n.*** (١) وەستێنەر (مرۆڤ، ئامێر، شت).
(٢) دەمەوانە؛ تەپەدۆر؛ تۆپەوانە؛ پشك.

***v.t.*** دەم نانەوە (بە دەمەوانە) دەم گرتن؛ داخستن؛ گرتن.

**stoppel** (stop′'l), ***n.*** دەمەوانە؛ تۆپەوانە؛ تەپەدۆر؛ پشك.
(هەروەها " stopper " )

***v.t.*** دەم نانەوە (بە دەمەوانە)؛ دەم گرتن؛ داخستن؛ گرتن.

**stop sign,** نیشانەی وەستان (هاتوچۆی ئوتومبیل).

**stop watch,** کاتژمێری کات ڕاگرتن: کاتژمێرێکە دەتوانرێ بوەستێنرێ‌و بخرێتەوە ئیش لە چرکەیەکدا بۆ کات ڕاگرتنی پێشبڕکێ بەکاردەهێنرێ

**storage** (stôr′ij, stō′rij), ***n.*** (١) عەمارکردن؛ کۆکردنەوە؛ هەڵگرتن؛ خستنە بارخانەوە. (٢) عەمار؛ گەنجینە؛ کۆگا؛ بارخانە.
(٣) کرێی عەمارکردن. (٤) پڕکردنەوەی باتری.

**storage battery,** باتری پڕکراوە.

**storax** (stō′raks), ***n.*** (١) چەند جۆرە درەختێکن جەوی‌یەکی بۆن خۆشیان لێ دەردێت. (٢) جەوی ئەم درەختانە.
(٣) شیلەیەکی بۆن خۆشە لە هەندێك لەم درەختانە دەردێت‌و دەکرێ بە دەرمان.

**store** (stôr, stōr), ***n.*** (١) ئازووقە؛ قایمەکاری؛ یەدەك.
(٢) فرۆشگا؛ دووکان؛ کۆگا (٣) عەمار؛ بارخانە.
(٤) ژمارەیەکی زۆر؛ هەندێکی زۆر؛ فرە.

***v.t.*** (١) ئازووقەخستن؛ قایمەکاری کردن؛ هەڵگرتن یا خستنەلاوە بۆ دواڕۆژ.
(٢) پڕکردن؛ پڕکردنەوە؛ تێخستن؛ پێدان.
(٣) عەمارکردن؛ خستنە بارخانەوە.

**in store,** (١) هەڵگیراو بۆ دواڕۆژ (٢) هێشتا ماوە کە ڕوو بدات.

**set no great store by,** بایەخ پێ نەدان؛ بە هیچ‌وپووچ دانان؛ لەلا بێ نرخ بوون.

**set store by,** بایەخ پێدان؛ لەلا بەنرخ بوون؛ بە گرنگ دانان.

**store-house** (stôr′hous′, stōr′hous′), ***n.*** عەمار؛ بارخانە.

**store-keeper** (stôr′kēp′ēr, stōr′kēp′ēr), ***n.***
دوکاندار؛
دوکانچی.

**store-room** (stôr′rōōm′, stōr′room′), ***n.*** گەنجینە؛ عەمار.

**storey** (stôr′i, stō′ri), ***n.*** [British], نهۆم؛ قات.

**storied** (stôr′id, stō′rid), ***adj.*** (١) ڕازاوەتەوە بە نەخشەی مێژوویی‌و داستانی‌یەوە: ***( ~ tapestry)*** .
(٢) بەناوبانگە لە مێژوو یا داستاندا.

**storied** (stôr′id, stō′rid), ***adj.*** چەند نهۆمی؛ چەند قاتی؛ ئەوەندە نهۆمی هەیە: ***( three- ~ )*** .

**storiette,** کورتە چیرۆك.

**stork** (stôrk), ***n.*** حاجی لەقلەق؛ لەقلەق

**stork's-bill** (stôrks′bil′), ***n.*** ڕووەکێکە بەرەکەی لە دەنووك دەچێت.

**storm** (stôrm), ***n.*** (١) زریان؛ گەرداو؛ باوبۆران؛ گەردەلوول.
(٢) لێزمە باران؛ بەفر، باران، یا تەرزەیەکی زۆر.
(٣) بای زۆر بەهێزو تیژ (٦٤-٧٢ میل لە ساتێکدا).
(٤) گوللە باران؛ تۆپ باران: ***( a ~ of bullets )*** .
(٥) هەڵچوون؛ لێشاو؛ وورووژم. ***( a ~ of criticism )*** .
(٦) پشێوی (کۆمەڵایەتی یا ڕامیاری)؛ ئاشووب.
(٧) هێرشی سەر سەنگەر؛ پەلاماردان؛ هەڵمەت.

***v.i.*** (١) کردن بە باوبۆران؛ کردن بە زریان؛ باران یا بەفر زۆر بارین:
***( It ~ed last night.)***
(٢) هەڵچوون؛ شێتگیربوون؛ زۆر تووڕەبوون؛ قوشقی بوون.
(٣) زۆر بە تووڕەیی‌و بەپەلە چوونەدەرەوە، ڕۆیشتن یا هاتنەژوورەوە.
***( She ~ed into the room.; He ~ed out of the office.)***

***v.t.*** (١) هێرش بردنەسەر بەبێ پەرواو بە توندوتیژی:
***( They ~ed him with questions.)***
(٢) هێرش بردنەسەر؛ پەلاماردان؛ پەلاماردان‌و گرتن:
***( The police ~ed the building and captured the thieves.)***

**storm-bound** (stôrm′bound′), ***adj.*** ڕێ لێ گیراو بەهۆی باوبۆرانەوە؛ لە شوێنی تر دابڕاو یا پچڕاو بەهۆی بەفرو بارانەوە.

**storm cellar,** ژووری ژێرزەمینی گەرداو یا گێژەڵووکەی بەهێز.

**storm center,** (١) ناوجەرگەی زریان.
(٢) ناوجەرگەی ئاشووب یا پشێوی.

**storm door,** دەرگای باوبۆران: دەرگایەکە لەدەرەوەی دەرگای دەرەوە بۆ پاراستن لە باوبۆران.

**storm petrel,** باڵندەیەکی بچووکی ڕەش‌و سپی دەریایی‌یە (گوایە نیشانەی زریانە).

**storm-proof** (stôrm′proof´), *adj.* باوبۆران کارتێنەکەر.

**storm-trooper,** زریانە سەرباز: ئەندامی چەکداری هێزی چەکداری نازی‌یەکانی ئەڵمانیا (کە بە توندوتیژی ناسرابوون).

**storm window,** پەنجەرەی زریان: پەنجەرەیەکە لەدەرەوەی پەنجەرەی ئاسایی‌یەوە بۆ پاراستن لە با و سەرما وسۆڵەی زستان.

**stormy** (stôr′mi), *adj.* (١) زریاناوی؛ باوبۆراناوی؛ سەخت: *( a ~ day ; a ~ sea)*
(٢) بەجۆش، گەرم (گفتوگۆ)؛ توندوتیژ؛ بێ ئاسوودە: *( a ~ argument; a ~ relationship)*
-stormily *(adv.)*; storminess *(n.)*.

**stormy petrel,** گێرەشێوێن: ئاژاوەچی؛ سەر بە گۆبەنگ؛ ئاشووبگێڕ.

**story** (stôr′i, stō′ri), *n.* (١) چیرۆک گێڕانەوە؛ هۆنینەوە.
(٢) (ا) چیرۆک؛ داستان؛ سەرگوروشتە؛ سەرگوزەشتە. (ب) کورتە چیرۆک.
(٣) ڕووداوەکانی چیرۆکێک یا شانۆنامەیەک.
(٤) قاو، ووت‌ووات؛ مقۆمقۆ؛ بەندوباو. (٥) [Colloq.]، درۆ.
(٦) [Archaic]، مێژوو
(٧) (ا) چیرۆک یا دەنگوباس (لە ڕۆژنامە یا ڕادیۆو تەلەفزیۆندا)؛ بەسەرهات.
(ب) کەسێک یا بەسەرهاتێک کە شایانی باسە لە ڕۆژنامەو ڕادیۆو تەلەفزیۆندا.
*v.t.* (١) باس کردن؛ هۆنینەوە؛ گێڕانەوە لە چیرۆکێکدا.
(٢) ڕازاندنەوە بە تابلۆو نەخشەی مێژوویی.

**story, storey** (stôr′i, stō′ri), *n.* (١) نهۆم؛ قات.
(٢) هەموو ژوورەکانی نهۆمێک. (٣) چین.

**story-teller** (stôr′i-tel´ēr, stō′ri-tel´ēr), *n.* (١) چیرۆک بێژ؛ چیرۆک گێڕەوە. (٢) [Colloq.]، درۆزن.

**story-writer,** چیرۆک نووس

**stotinka** (stô-tiŋ′ka), *n.* پارەیەکی بولغاری بچووکە.

**stound** (stound), *n.* (١) ساتێک؛ ماوەیەکی کەم.
(٢) [Obs. or Dial.]، ئێش؛ ئازار.

**stoup** (stōōp), *n. Also* stoop, (١) (ا) کاسە؛ پەرداخ؛ کووپ.
(ب) پڕ پەرداخێک یا کاسەیەک. (٢) [Scot.]، سەتڵ.
(٣) جورنە یا حەوزی بچووکی پیرۆزی بەردەمی کڵێسە.

**stout** (stout), *adj.* (١) ئازا؛ چاونەترس؛ بەجەرگ. (٢) کۆڵنەدەر.
(٣) (ا) بەهێز؛ تۆکمە؛ تێکسمڕاو.
(ب) قایم؛ پتەو؛ تۆکمە: *( a ~ wall)* .
(٤) توندوتیژ؛ قایم؛ بەهێز؛ توند؛ بەتین: *( a ~ wind; a ~ attack)* .
(٥) قەڵەو؛ کەتە؛ خڕوپڕ؛ پان‌وپۆڕ؛ گۆشتن.
*n.* (١) کەسێکی قەڵەو. (٢) جل‌وبەرگی کەسێکی قەڵەو.
(٣) بیرەیەکی بەتینی قاوەیی‌یە.
-stoutly *(adv.)*; stoutness *(n.)*.

**stout-hearted** (stout′här´tid), *adj.* ئازا؛ بەجەرگ؛ دلێر؛ چاونەترس

**stove** (stōv), *n.* (١) (ا) زۆپا. (ب) چێشت لێنەر (هی گاز یا کارەبا)
(٢) (ا) کن؛ کوورەی گۆزەو دیزە سوورکردنەوە
(ب) ژووری گەرمی شەتڵ‌و ڕووەک پێ گەیاندن.

**stove** (stōv), *alternative past tense and p.p. of* stave.

**stove-pipe** (stōv′pīp´), *n.* (١) لوولە زۆپا.
(٢) [Colloq.]، کڵاوێکی ئاوریشمی درێژکۆڵەی پیاوانەیە.
(پێشی دەووترێ " stove-pipe hat ").

**stover** (stō′vēr), *n.* (١) لاسکە گەنمەشامی (کە دەدرێ بە ئاژەڵ وەك ئالف. (٢) [British Dial.]، ئالف

**stow** (stō), *v.t.* (١) پێچانەوەو هەڵگرتن بە ڕێك‌وپێکی؛ هەڵگرتن؛ عەمارکردن: *( He ~ed various articles in his knapsack.)* .
(٢) پڕکردن بە ڕێك‌وپێکی. (٣) جێ تێدابوونەوە (دەفر، ژوور... هتد).
(٤) [Obs.]، حەواندنەوە؛ جێکردنەوە؛ لانەدان.
(٥) [Slang]، بڕینەوە؛ وەستاندن: *( ~ the chatter.)* .
(٦) [Slang]، ماشینەوە؛ هەڵ لووشین.

**stow away,** (١) خستنەلاوە؛ شاردنەوە؛ هەڵگرتن لە جێ‌یەکی باشدا.
(٢) بە قاچاخی سواری کەشتی‌و شەمەندەفەر بوون بۆ کرێ نەدان یا هەڵهاتن؛ خۆشاردنەوە لە کەشتی‌و شەمەندەفەردا بۆ ئەم مەبەستە.

**stowage** (stō′ij), *n.* (١) پێچانەوەو هەڵگرتن بە ڕێك‌وپێکی؛ عەمارکردن.
(٢) عەمار؛ بارخانە؛ جێی شت هەڵگرتن. (٣) شتی عەمارکراو یا هەڵگیراو
(٤) کرێی عەمارکردن یا هەڵگرتن.

**stowaway** (stō′ə-wā´), *n.* ڕێبواری قاچاخ: کەسێکە کە بە قاچاخی سواری کەشتی‌و شەمەندەفەر دەبێ‌و خۆی دەشارێتەوە بۆ کرێ نەدان یا هەڵهاتن.

**strabismal** (strə-biz′m'l), *adj.* = **strabismic.**

**strabismic** (strə-biz′mik), *adj.* (١) تایبەتی بە خێلی. (٢) خێلی.

**strabismus** (strə-biz′məs), *n.* خێلی؛ خێلێتی.

**strabotomy** (strə-bot′ə-mi), *n.* چاککردنەوەی خێلی (نەشتەرکاری).

**straddle** (strad′'l), *v.t.* (١) گەڵ بڵاوکردنەوە (لە دانیشتن، وەستان، ڕۆیشتن، یا سواربووندا)؛ لاق بڵاوکردنەوە؛ سواربوون: *( to ~ a horse)*
(٢) گرتنەوە؛ پەل بەسەردا کێشان: *( Our land ~s five countries.)*
(٣) دوودڵی کردن؛ خۆ ساغ نەکردنەوە بە لایەکدا؛ لەگەڵ هەردوو لادا بوون *( to ~ an issue)*
*v.i.* (١) گەڵ بڵاوکردنەوە (لە دانیشتن، وەستان، ڕۆیشتن، یا سواربووندا)؛ لاق بڵاوکردنەوە. (٢) پەل فڕێدان بە هەموولایەکدا.
(٣) خۆ ساغ نەکردنەوە بە لایەکدا؛ لایەنگیری هەردوو لای مەسەلەیەك کردن؛ ڕاڕایی کردن.
*n.* (١) گەڵ بڵاوی؛ قاچ بڵاوکردنەوە. (٢) ماوەی بەینی گەڵی بڵاو.
(٣) [Colloq.]، ڕاڕایی؛ خۆ ساغ نەکردنەوە بەسەر هیچ لایەکدا؛ پاڵپشتی هەردوولا کردن. (٤) مافی کڕین‌و فرۆشتن (پارەبازی).

**strafe** (strāf, sträf), *v.t.* بۆردومان کردن؛ بۆمباران کردن.
*n.* بۆردومان؛ بۆمباران.

**straggle** (strag′'l), *v.i.* (١) لە ڕێ لادان؛ سەرگەردان بوون؛ ڕێ وون کردن؛ وون بوون؛ لە کۆمەڵ دابڕان؛ لە کاروان بەجێمان؛ لێ جیابوونەوە.
(٢) پێدا بڵاوبوونەوە بە ناڕێك‌وپێکی؛ پرش‌و بڵاوبوونەوە: *( weeds ~ing over a garden; trees ~ing over the countryside)*
*n.* کۆمەڵێکی پرش‌و بڵاوو ناڕێك‌وپێك (مرۆڤ، شتومەك... هتد).
-straggler *(n.)*.

**straggly** (strag′li), *adj.* پرش‌و بڵاوو ناڕێك‌وپێك؛ بە ناڕێك‌وپێکی ڕوواو یا بڵاوبووەوە: *( a ~ beard)* .

**straight** (strāt), *adj.* (١) ڕاست؛ ڕێك: *( a ~ line, road, etc.)* .
(٢) (ا) ڕێك؛ نەنوشتاوە؛ قنج: *( a ~ back )* .
(ب) خاو (قژ)؛ لوول نی‌یە: *( ~ hair )* .
(٣) ڕاست‌و ڕەوان؛ بێ لادان؛ ڕێك: *( a ~ course )* .
(٤) ڕێك‌وپێك: *( Put your room ~ .)* .
(٥) (ا) سەرڕاست؛ ڕاستڕۆ؛ پاك ڕەووشت.
(ب) [Colloq.]، پشت پێ بەستراو (دەنگوباس)؛ ڕاست.
(٦) وورد؛ ڕێك‌وپێك. (٧) لەڕوو؛ قسە لەڕوو.
(٨) ڕوون نەکراوەتەوە؛ یەکسەر؛ پوخت: *( ~ whisky)* .
(٩) بەبێ پێچ‌وپەنا؛ ڕاستەوڕاست؛ ڕاست‌و ڕەوان: *( a ~ answer)* .
(١٠) تێکڕا (نرخ): *( The apples are ten cents ~ .)* .
(١١) بە ڕیز (پێڕی کاغەزی قومار).
*adv.* (١) بە ڕاستی؛ لەسەر هێڵێکی ڕاست؛ بە ڕێکی؛ ڕێك: *( to walk ~ )* .
(٢) بە ستوونی؛ بە قنجی؛ بە ڕێك وەستاوی.
(٣) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ: *( The doctors went ~ to the hospital.)*
*n.* (١) ڕاستی؛ ڕێکی.

(٢) (ا) بەشی ڕاستو ڕێکی مەیانی پێشبڕکێ (بەتایبەتی دوا قۆناغ).
(ب) پێبڕی بە ڕیزی کاغەزی قومار.
**go straight,** [Colloq.], واز لە تاوانکاری هێنان؛
هاتنە سەر ڕێی ڕاست
**keep a straight face,** نەهاتنە پێکەنین؛ پێ نەکەنین؛ خۆ تێك نەدان.
**straight away (or off),** یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ.
**-straightly** ***(adv.)***; **straightness** ***(n.)***.
**straight angle,** گۆشەی ڕاست، واتە ١٨٠ پلە.
**straight-arm** (strāt′ärm´), ***v.t.*** پاڵ پێوەنانی یاریکەری تیپی
بەرامبەر بە قۆڵ درێژکردنەوە بە ڕاستی (فوتبۆڵی ئەمریکی).
***n.*** ئەم جۆرە پاڵە
**straight-away** (strāt′ə-wā´), ***adj.*** (١) ڕاست؛ ڕێك.
(٢) یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ.
***n.*** مەیانی پێشبڕکێی ڕاست، واتە ناخواروخێچ.
***adv.*** یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ.
**straight-edge** (strāt′ej´), ***n.*** ڕاستە. پارچەیەك تەختە یا ئاسنە
قەراغێکی ڕاستە بۆ ڕاکێشانو تاقیکردنەوەی هێڵی ڕاست بەکاردەهێنرێ.
**straighten** (strāt′'n), ***v.t.*** ڕاستکردنەوە.
***v.i.*** ڕاستبوونەوە
**straight face,** دەموچاوی هەست پیشان نەدەر.
**-straight faced** ***(adj.)***.
**straight-forward** (strāt´fôr′wẽrd), ***adj.*** (١) ڕاست؛ ڕێك؛
بێ خواروخێچی؛ ڕاستەوخۆ؛ ڕێكوڕەوان.
(٢) ڕاستەوڕوو؛ بێ پێچوپەنا؛ بێ درۆو دەلەسە:
***( a ~ answer, explanation, etc.)***
(٢) ڕوون؛ ئاسان؛ دیار.
***adv.*** بە ڕێكو ڕاستی؛ ڕاستەوخۆ؛ بێ پێچوپەنا.
**straight-forwards** (strāt´fôr′wẽrdz), ***adv.*** = **straight-forward.**
**straight-line** (strāt′līn´), ***adj.*** (١) ڕاست (هێڵ)؛ ڕاستو ڕێك.
(٢) لە هێڵی ڕاست پێکهاتوو.
**straight-out** (strāt′out′), ***adj.*** (١) ڕێكوڕەوان.
(٢) ئاشکرا؛ بێ پێچوپەنا. (٣) تەواو؛ بەتەواوی.
**straightway** (strāt′wā´), ***adv.*** یەکسەر؛ ڕاستەوخۆ؛ بێ دواکەوتن؛
ڕاستەوڕاست
**strain** (strān), ***v.t.*** (١) توند ڕاکێشان؛ شەتەکدان؛ زۆر ڕاکێشان یا
کشاندن؛ زۆر توندکردنەوە. (٢) ڕەتاندن؛ ماندووکردن؛ ئەرك زۆر خستنەسەر.
(٣) ئازاردان؛ لە جێ بردن: ***( He ~ed a muscle climbing.)*** .
(٤) ڕاکێشان لە سنووری خۆی زیاتر؛ لە تام کردنەدەرەوە؛ لە سنوور دەرکردن؛
زۆر کشاندن: ***( He ~ed the rule to his own advantage.)*** .
(٥) پاڵاوتن؛ پوختکردن؛ لەبێژنگدان.
(٦) گرتنە باوەش؛ باوەش پیاکردن.
(٧) خواروخێچ کردن یا شێوە تێکدان بە زەبر خستنەسەر.
(٨) [Obs.]، زۆرلێکردن؛ زۆر خستنەسەر.
***v.i.*** (١) زۆر هەوڵدان؛ زۆر خۆ ماندووکردن؛ زۆر کۆشش کردن؛ زۆر لەخۆکردن:
***( She ~ed to win.)***
(٢) کرژبوون (٣) لە ژێر زەبرێکی زۆردا بوون؛ ئەرك لەسەر بوون.
(٤) توند ڕاکێشان؛ کشان. (٥) پاڵاوتران؛ پوخت بوون.
***n.*** (١) توند ڕاکێشان؛ کشان؛ زۆر ڕاکێشران؛ شەتەك؛ کرژی.
(٢) هەوڵو کۆششێکی زۆر؛ ماندووبوونێکی زۆر.
(٣) لە جێ چوون (ماسولکە، جومگە). (٤) خواروخێچی لەژێر زەبردا.
(٥) زەبر. (٦) بارێکی قورس؛ ئەرکێکی گرانو ماندووکەر (هەموو جۆرێك):
***( a ~ on his financial resources)***
**strain at,** (١) بە توند پاڵ پێوەنان؛ بە توند ڕاکێشان؛
زۆر پێوە ماندووبوون یا خەریك بوون. (٢) سڵ لێکردنەوە؛ نەچوونە ژێر بار.

**strain** (strān), ***n.*** (١) (ا) منداڵ خستنەوە؛ منداڵ بوون. (ب) منداڵ.
(٢) بنەچە؛ باوباپیر؛ بنەماڵە. (٣) وەچە؛ نەوە؛ بەرە.
(٤) نەوەی جیاواز. (٥) جۆر؛ چەشن: ***( a ~ of flu )*** .
(٦) تایبەخۆی زگماکی.
(٧) دەمار؛ نیشانە: ***( a ~ of cruelty, madness, etc.)*** .
(٨) شێواز (نووسین، گفتوگۆ، کردار): ***( He wrote in an angry ~ .)***
(٩) (*pl.*) ، ئاواز؛ پارچە مۆسیقا.
**strained** (strān′d), ***adj.*** (١) بەزۆر کراو؛ بە خۆشی خۆ نەکراو.
(٢) ناکۆك؛ ناخۆش (پەیوەندی):
***( ~ relations between the two countries)***
**strainer** (strān′ẽr), ***n.*** (١) ئامێری شەتەکدان یا توندکردنەوە.
(٢) پاڵێوك؛ پاڵێوکە؛ پاڵوێنە؛ چاپاڵێو.
**strait** (strāt), ***adj.*** (١) تەنگ؛ تەسك (جلوبەرگ).
(٢) [Archaic]، توندوتیژ (ڕەوشت)؛ بەویژدان؛ ڕاست (ڕەفتار)؛ تەسکبین
(٣) (ا) قورس؛ ناخۆش؛ گران. (ب) کەم (دەرامەت).
***n.*** (١) ڕێیەکی تەسك.
(٢) (*pl.*)، گەروئاو (دوو دەریا بەیەك دەگەیێنێ)؛ تەنگاو؛ دڕناڵ.
(٣) (*pl.*) ، ناخۆشی (دەرامەت، باری ژیان)؛ پەریشانی؛ نەبوونی؛ تەنگانە:
***( in desperate ~s ; a man in financial ~s )***
(٤) [Rare]، **isthmus** .
**straiten** (strāt′'n), ***v.t.*** (١) تەسك کردنەوە؛ هێنانەوەیەك.
(٢) تووشی ناخۆشی کردن؛ بێ دەرامەت بوون؛ تووشی هەژاریو نەبوونی بوون:
***( in ~ed circumstances)***
**strait jacket,** ***Also*** **straight jacket,** (١) چاکەتی شێتو
تاوانکاران: بەرگێکە وەك چاکەت دەکرێتە بەری شێتو تاوانکاران باڵیان
دەبەستێتەوە بۆ ئەوەی زیان بە خەڵكو خۆیان نەگەیەنن. (٢) کۆت
***v.t.*** بەستنەوە؛ ڕێ لێگرتن.
**strait-laced** (strāt′lāst´), ***adj.*** (١) (ا) شەتەکدراو (کەمەربەند)؛
تەسك. (ب) جلی تەسك لەبەرکەر. (٢) توندوتیژ (ڕەوشت)؛ تەسکبین؛ توند
**strake** (strāk), ***n.*** تاکە دارو تەختە یا تەبەقە کانزایەکە کە کەشتی لێ
درووستکراوە بە درێژایی کەشتییەکە.
**stramineous** (strə-min′i-əs), ***adj.*** (١) کایی؛ بەلمی؛
لە پووش یا بەلم دەچێ. (٢) زەردباو؛ ڕەنگ کایی.
**stramonium** (strə-mō′ni-əm), ***n.*** (١) داتورە: ڕووەکێکی ژەهرینە
گوڵێکی سپیو بەرێکی دڕکاوی دەگرێت. (٢) گەڵای ئەم ڕووەکە (کە دەکرێت
بە دەرمانو وەك بەنگ بەکاردەهێنرێت).
**strand** (strand), ***n.*** کەنار دەریا؛ ڕۆخی دەریا.
***v.t. & v.i.*** (١) دان بە ڕۆخی دەریاداو چەقین یا پەککەوتن (کەشتی).
(٢) گیرخواردن؛ چەقین (مەجاز)؛ قەتیس بوون؛ پەککەوتن:
***( He went away leaving his family ~ed.; He was ~ed in a strange city with no money.)***
**strand** (strand), ***n.*** (١) تاڵە گوریس یا پەتك؛ تەل؛ یەکێك لەو تاڵ یا
تەلانەی با دەدرێن لەگەڵ هی تردا بۆ هۆنینەوەی گوریسو پەتك.
(٢) تاڵە موو؛ تاڵە قژ؛ لیسپ؛ لۆی پرچی هۆنراوە؛ تەل: ***( a ~ of hair)***
***v.t.*** (١) هۆنینەوە (گوریس، پەت، پرچ). (٢) پچڕاندن (گوریس، پەت، تەل).
**strand line,** ڕۆخی دەریا (بەتایبەتی ئەو هێڵ یا ئاستەی بەرزاو لێوەی
کشاوەتەوە).
**strange** (strānj), ***adj.*** (١) بێگانە؛ نامۆ؛ دەرەکی؛ جیا.
(٢) نەناسراو؛ نەزانراو؛ نەبیستراو؛ تازە؛ نادیدە. (٣) سەرئاسا؛ نائاسا.
(٤) سەیر؛ ئەنتیکە. (٥) گۆشەگیر؛ دوورەپەرێز.
(٦) نەشارەزا؛ نەزان؛ ناکارامە؛ تازە: ***( He was ~ to the job.)*** .
***adv.*** بەشێوەیەکی سەیر.
**-strangely** ***(adv.)***; **strangeness** ***(n.)***.
**stranger** (strān′jẽr), ***n.*** (١) بێگانە؛ نامۆ؛ ئارەکی؛ ئاوارە؛ غەوارە.
(٢) میوان. (٣) نەناسیاو؛ نەناس.

(٤) نەشارەزا؛ تازەکوورە؛ تازە؛ نەزان: ***( He is a ~ to hate.)***.
**strangle** (straŋ′g'l), *v.t.* (١) خنکاندن؛ تاساندن.
(٢) پێشێل کردن؛ پێپەستکردن؛ کپکردنەوە؛ سەرکوتکردن؛ خەفەکردن.
(٣) بەستنەوە
*v.i.* خنکان؛ تاسان.
**strangle hold,** (١) گرتنێکی هەناسەلێبڕ (زۆرانبازی).
(٢) هێزێکی هەناسەلێبڕ یا خەفەکەر؛ هێزێکی خنکێنەر یا کپکەرەوە؛ کۆت:
***( Tarrifs put a ~ on trade.)***
**strangles** (straŋ′g'lz), *n.* تای ئەسپ.
**strangulate** (straŋ′gyoo-lāt´), *v.t.* (١) خنکاندن؛ تاساندن.
(٢) هێنانەوەیەك و ڕێی هاتوچۆی خوێن و شلەی تر گرتن (پزیشکەوانی)؛ گرتن؛ بەرگرتن
*v.i.* (١) خنکان؛ تاسان. (٢) گیران؛ بەرگیران.
**strangulation** (straŋ´gyoo-lā′shən), *n.* (١) خنکان؛ تاسان.
(٢) گیران (بۆری خوێن، ڕیخۆڵە، بۆری میز... هتد)؛ بەرگیران.
**strangury** (staŋ′gyoo-ri), *n.* میزەچۆڕکێ بە ئازارەوە.
**strap** (strap), *n.* (١) قایش؛ پشتێن: ***( a watch- ~ )***.
(٢) پارچە تەل یا پەتکێ شت پێ بەستنەوە
(٣) قایشی جزمە هەڵکێشان؛ قایشی سەر شان
(٤) چەرمی چەقۆو گوێزان تیژکردنەوە. (پێشی دەووترێ: " **strop** ").
(٥) قامچی.
*v.t.* (١) بەستنەوە یا توندکردنەوە بە قایش؛ بەستنەوە.
(٢) قامچی لێدان؛ بە قامچی لێدان. (٣) گوێزان و چەقۆ تیژکردنەوە بە قایش.
**strap-hanger** (strap′haŋ´ẽr), *n.* سواری دەست بە قایشەوە گر: سوارێکە کە خۆی هەڵدەواسێ بە قایشی بنمیچی پاسەوە بە پێوە لەبەر بێ جێگەیی
**strapless** (strap′lis), *adj.* (١) بێ قایش
(٢) تایبەتی بە کراسی ژنانەی شان ڕووت.
**strappado** (strə-pā′dō, strə-pä′dō), *n.* (١) جۆرێکە لە سزادان بریتییە لە بەستنەوەی مەچەکی کەسێك بە قایش و هەڵواسینی بە دارێکەوە بە جۆرێك کە بە هەواوە بمێنێتەوە. (٢) کەرەسەی ئەم سزادانە.
**strapped** (strap′it′), *adj.* دەستکورت؛ بێ پارە؛ بێ دەرامەت:
***( He is often ~ for cash.)***
**strapper** (strap′ẽr), *n.* (١) مەیتەر.
(٢) [Colloq.]، کەسێکی درێژی تێکسمڕاو؛ کەسێکی زل یا تۆکمە.
**strapping** (strap′iŋ), *adj.* [Colloq.], درێژو تێکسمڕاو؛ زل؛ تۆکمە؛ چوارشانە.
**strass** (stras), *n.* شووشەیەکی قورقوشمی بریقەدارە خشڵی دەستکردی لێ درووست دەکرێ.
**strata** (strā′tə, strat′ə), *alternative plural of* **stratum**.
**stratagem** (strat′ə-jəm), *n.* (١) فێڵ و تەڵەکەی جەنگ.
(٢) فێڵ؛ فێڵ و تەڵەکە.
**strategic** (strə-tē′jik), *adj. Also* **strategical**, (١) ستراتیجی؛ تایبەتی بە ستراتیجی. (٢) سوودبەخش. (٣) پێویست؛ گرنگ.
-**strategically** *(adv.).*
**strategics** (strə-tē′jiks), *n.pl.* = **strategy.**
**strategist** (strat′ə-jist), *n.* ستراتیجیزان؛ لێهاتوو لە ستراتیجدا.
**strategy** (strat′ə-ji), *n.* (١) ستراتیجی جەنگ؛ لەشکرگێڕی؛ دانانی پیلانی جەنگ و لەشکر بەڕێوەبردن. (٢) پیلانێکی ستراتیجی.
(٣) زانایی پیلان دانان و بەڕێوەبردن (بەتایبەتی بەکارهێنانی فێڵ و تەڵەکە)؛ شارەزایی پیلان دانان؛ پیلان گێڕی.
**strath** (strath), *n.* چەمی پان و تەخت؛ دۆڵی پان.
**strathspey** (strath′spā´), *n.* (١) سەمایەکی ئوسکوتلەندییە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**strati-** (strat′ə), پێشگرێکە بەمانای: چین ***( stratiform)***.

**straticulate** (strə-tik′yoo-lit, strə-tik′yoo-lāt´), ***adj.*** چین چیناوی تەنك (زەمینناسی).
**stratification** (strat´ə-fi-kā′shən), ***n.*** (١) چین چین کردن.
(٢) چین چیناوی. (٣) چین (زەمینناسی).
**stratiform** (strat′ə-fôrm´), ***adj.*** چین چین؛ چین چیناوی.
**stratify** (strat′ə-fī´), ***v.t.*** (١) (ا) چین چین کردن؛ بە چین چین دانان.
(ب) کردن بە چین چینی کۆمەڵایەتییەوە. (٢) تۆو هەڵگرتن یا پاراستن بە خستنە نێوان چینی لمی شێدارو خاك و شتی وەهاوە.
***v.i.*** (١) پێکهاتن بە چین چین. (٢) بەش بوون بە چین چینەوە (کۆمەڵ).
**stratigraphy** (strə-tig′rə-fi), ***n.*** (١) شێوەی ڕیزبوون و ڕێکخستنی چینەکانی زەمین؛ شێوەی ڕێکخستنی چینەکانی بەردی چین چین.
(٢) چینناسی: زانستی لێکۆڵینەوەی ڕیزبوون و ڕێکخستنی چینەکانی زەمین و بەردی چین چین (زەمینناسی).
-**stratigraphic; stratigraphical** ***(adj.)***; **stratigraphically** ***(adv.).***
**stratocracy** (strə-tok′rə-si), ***n.*** فەرمانڕەوایی سوپا.
**stratocumulus** (strā´tō-kū′myoo-ləs), ***n.*** هەوری ڕەشی چین چین لەسەر یەك کەڵەکەبوو (بەتایبەتی لە زستاندا).
**stratosphere** (strat′ə-sfêr´, strā′tə-sfêr´), ***n.*** ستراتۆسفیر: بەشی لاسەرووی بۆشایی ئاسمان (کە لە حەوت میل لەسەرو زەمینەوە دەست پێ دەکات).
-**stratospheric** ***(adj.).***
**stratum** (strā′təm, strat′əm), ***n.*** (١) چین (زیندەوەرزانی، زەمینناسی)؛ توێژ؛ توێژاڵ؛ توێ.
(٢) چین (کۆمەڵ)؛ پلە: ***( the highest ~ of society)***.
**stratus** (strā′təs), ***n*** ستراتەس: جۆرە هەورێکی نزمی ڕەنگ خۆڵەمێشی چین چینە.
**straw** (strô), ***n.*** (١) پووش؛ پووشکە؛ بەلم؛ کا. (٢) تاکە پووشێك.
(٣) قامیش: لوولەیەکی باریك (بۆ خواردنەوە هەڵمژین).
(٤) شتێکی هیچ و پووچ و بێ نرخ.
***adj.*** (١) زەردی کاڵ؛ ڕەنگ پووشی. (٢) لە پووش دروستکراو؛ پووش.
(٣) هیچ و پووچ؛ بێ نرخ؛ بێ بایەخ.
**a straw in the wind,** نوقلانە؛ نیشانەی شتی داهاتوو یا ڕووداوی دواڕۆژ.
**catch ( or clutch, grasp ) at a straw,** پەنابردن بۆ هەر شتێك کە ئومێدی ڕزگاری لێ بکرێت.
**not worth a straw,** پووشکەیە ناهێنێت؛ بێ نرخە؛ هیچ و پووچە.
**the last straw,** دوا سەربار؛ دوا تێن؛ سەرباری پشت شکێن (مەجاز).
**to make bricks without straw,** هەڵسان بە کارێك بەبێ کەرەسەی پێویست.
**strawberry** (strô′ber´i, strô′bẽr-i), ***n.*** شلێك؛ چیلك.
**strawboard** (strô′bôrd´, strô′bōrd´), ***n.*** مقەبای پووش.
**straw boss,** [Colloq.], یاریدەدەری کارگێڕ یا سەرکار.
**straw color,** ڕەنگی زەردی کاڵ.
**straw hat,** کڵاوی پووش.
**strawmat,** حەسیر.
**straw man,** (١) داهۆڵ؛ داهۆڵی پووش.
(٢) بەڵگەی بۆش: بەڵگەیەکی بۆشی هەڵبەستراوە بە دەستەنقەست هەر بۆ بەدرۆخستنەوەی و پێ سەلماندنی مەبەستێکی تایبەتی؛ پێشکەشکەری ئەم بەڵگە بۆشە. (٣) شایەتی بەدرۆخراوە یا درۆزن.
(٤) کەسێکی هیچ و پووچ و بێ بایەخ؛ کەسێکی هیچ.
**straw vote,** ڕاوەرگرتنی نموونەیەك لە هاووڵاتیان دەربارەی مەسەلەیەك.
**straw wine,** شەرابی پووش: شەرابێکی خەست و شیرینە لە ترێی لەسەر پووش هەڵخراو و وشك کراوە درووست دەکرێ.
**straw worm,** کرمێکە قەفی گەنم و دەغڵ و دانی تر دەخوات.

**stray** (strā), *v.i.* (١) لە ڕێ لادان؛ وون بوون؛ ڕێ وون کردن؛ وێڵ بوون؛ تەرەبوون؛ لە کۆمەڵ دابڕان؛ بڕبوون. (٢) لە ڕێی ڕاست لادان؛ ڕێی هەڵە گرتن؛ ڕێی خراپ گرتن؛ گومڕابوون؛ خراپەکردن.
(٣) لە باس لادان؛ لادان:
***( Their thoughts ~ed as she entered the room.)***
***n.*** (١) کەسێك یا گیاندارێکی وێڵ یا وون؛ گیانداری بەرەڵا، خوێڕی، تەرە، یا بێ خاوەن (بەتایبەتی سەگ و پشیلە). (٢) (*pl.*)، ووژەووژی ڕادیۆ
***adj.*** (١) وێڵ؛ وون؛ خوێڕی؛ بەرەڵا؛ گومڕا؛ بێ خاوەن؛ تەرە:
***( a ~ cat, dog, etc. ; a ~ bullet )***
(٢) ناوبەناو؛ ڕێکەوت: ***( We caught only a few ~ words.)*** .
**streak** (strēk), *n.* (١) لەکە یا پەڵەیەکی باریك و درێژ؛ نیشانەی درێژکۆلە؛ هێڵی ڕەنگ جیاواز لە دەورووبەرەکەی: ***( ~s of mud )*** .
(٢) برووسکە. (٣) چین (کانزا).
(٤) توێژی چەوری یا بەزی گۆشت.
(٥) تایبەخۆ؛ دەمار؛ نیشانە:
***( a nervous ~ ; a mean ~ ; a ~ of cruelty, madness, etc.)***
(٦) [Colloq.]، زنجیرە؛ ڕستە؛ چەند ڕوودانێکی یەك لە دوای یەك:
***( a long ~ of bad luck)***
***v.t.*** (١) نیشانەکردن بە هێڵ؛ هێڵ پیاهێنان. (٢) پەڵە لێدان.
***v.i.*** (١) پەڵاوی بوون؛ هێڵ پیاهاتن؛ نیشانە لێ دەرکەوتن.
(٢) بریقەدانەوە؛ بریسکەدانەوە. (٣) خێرا ڕۆیشتن یا کارکردن؛ پەلەکردن لە شتدا. (٤) ڕاکردن بەناو خەڵکدا بە ڕووتی (هەر بۆ سەیر).
**like a streak,** زۆر خێرا (ڕۆیشتن، کارکردن) تیژ؛ وەك برووسکە.
**streaky** (strē′ki), *adj.* (١) میلدار؛ هێڵ هێڵ؛ پەڵاوی.
(٢) ناوبەناو (٣) نارێك؛ جیا؛ هەمووی وەك یەك باش نییە.
**-streakily** ***(adv.)***; **streakiness** ***(n.)***.
**streaker** (strē′kẽr), *n.* [Slang], کەسێکە کە بە ڕووتی بەناو خەڵکدا ڕادەکات.
**stream** (strēm), *n.* (١) جۆگە؛ جۆگەلە؛ چەم؛ ڕووباری بچووك.
(٢) تەوژم؛ لێشاو: ***( a ~ of cold air; a ~ of light)*** .
(٣) ڕیز؛ زنجیرە: ***( a ~ of cars )*** .
(٤) مۆدە؛ ڕێڕەوی باو؛ ڕێباز.
***v.i.*** (١) ڕۆیشتن (وەك ئاو بەناو جۆگەدا)؛ پیا ڕۆیشتن.
(٢) لێوەهاتن؛ بە لێشاو لێ هاتنەدەرەوە؛ لافاو لێ هەڵسان (مەجاز):
***( eyes ~ing with tears)***
(٣) بە کۆمەڵ ڕۆیشتن؛ کشان؛ پێکەوە بە جەماوەر ڕۆیشتن:
***( Hundreds of people were ~ing by our house in panic.)***
(٤) تەشەنەکردن؛ خێرا بڵاوبوونەوە؛ ووروژم بردن.
(٥) شەکانەوە.
(٦) شەوقدانەوە؛ شەوق لێبوونەوە؛ پرشنگدانەوە.
***v.t.*** (١) دەردان؛ لێوەهاتن. (٢) هەڵکردن (ئاڵا)؛ شەکاندنەوە.
**stream** (strēm), *n.* (١) ئاڵایەکی باریك و درێژ.
(٢) پارچە پەڕۆیەکی باریك و درێژی شۆڕبووەوە.
(٣) (أ) شەوقی ئاسۆ. (ب) (*pl.*)، **aurora borealis** .
(٤) سەرباسێکی ڕۆژنامەیە کە لەسەری لاپەڕەکەوە هەتا ئەوسەری بگرێتەوە.
**streamlet** (strēm′lit), *n.* جۆگەلە؛ جۆگەلەی بچووك.
**streamline** (strēm′līn´), *n.* (١) ڕێباز؛ ڕێڕەو.
(٢) شێوەی شتێك لەڕووی بەرهەڵستییەوە بۆ هەوا.
***adj.*** تایبەتی بە شێوەیەك کە بەرهەڵستی هەوا نەکات، واتە باش بڕوات:
***( a ~ boat)***
***v.t.*** (١) وەها دروستکردن بە جۆرێك کە بەرهەڵستی هەوا نەکات و باش بڕوات.
(٢) ڕێکخستن بە گوێرەی چەرخی تازە؛ تازەکردنەوە.
(٣) ڕێکخستن بە شێوەیەکی باشتر و بەسوودتر و کاریگەرتر لە جاران؛ چاکترکردن ***( The company has ~d its operations.)*** .
**streamlined** (strēm′līnd´), *adj.* (١) بەرهەڵستی هەوا نەکەر، واتە باش ڕۆیشتوو؛ خۆش ڕەوت.
(٢) بەشێوەیەکی تازە ڕێکخراو بۆ کاریگەری و ئاسانی و بەسوودی:
***( a ~ office)***
**stream of consciousness,** (١) زنجیرەی بیرو بەسەرهاتی نەپچڕاوی مرۆڤێك (دەروونناسی). (٢) شێوازێکی چیرۆك نووسینە بریتییە لە تۆمارکردنی هەموو هەست و ئەستێکی قارەمانی چیرۆکەکە بەبێ پچڕاندن ئەگەرچی پەیوەندیشیان بە چیرۆکەکەوە و بە یەکترییەوە زۆر نەبێ
**street** (strēt), *n.* (١) شەقام؛ جادە.
(٢) سەرچەقی جادە؛ سەر جادە: ***( Don't play in the ~ .)*** .
(٣) ئەو خەڵکەی لەمبەر و ئەوبەری شەقامێك کاردەکەن و دەژین:
***( The whole ~ contributed, protested, marched, etc.)***
**street-car** (strēt′kär´), *n.* ترام؛ شەمەندەفەری ناوشار؛ پاسی ناوشاری وەك شەمەندەفەر.
**street railway,** هێڵی ترام؛ هێڵی پاسی ناوشاری وەك شەمەندەفەر.
**street urchin,** منداڵی بێ لانەی سەرجادە؛ منداڵی بێکەس و بەرەڵا.
**street-walker** (strēt′wôk´ẽr), *n.* قەحبەی سەرجادە.
**strength** (streŋth, streŋkth), *n.* (١) هێز؛ تین؛ ووزە؛ پەك؛ هەناو؛ توانا؛ زەبر. (٢) بەرگەگرتن؛ جێری.
(٣) بەرگری؛ بەرهەڵستی؛ هێزی بەرگری کردن.
(٤) تین (دەرمان)؛ کاریگەری.
(٥) توندوتیژی (دەنگ، بۆن)؛ بەرزی (دەنگ)؛ تۆخی (ڕەنگ).
(٦) هێز: ***( The batallion is at full ~ .)*** .
(٧) پاڵپشت؛ پشتگیری.
(٨) نرخ بەرزبوونەوە (پارەبازی).
**on the strength of,** بەهۆی (ئەوەوە)؛ لەسەر (ئەوە).
**strengthen** (streŋ′thən, streŋk′thən), *v.t.* بەهێزکردن؛ بەهێزترکردن؛ قایم کردن؛ چەسپاندن.
***v.i.*** بەهێزبوون؛ بەهێزتربوون؛ چەسپان.
**strenuous** (stren′ū-əs), *adj.* (١) گران؛ سەخت؛ قورس:
***( a ~ task; ~ exercise)***
(٢) چالاك؛ بەجۆش؛ بەتین.
**-strenuousity** ***(n.)***; **strenuously** ***(adv.)***; **strenuousness** ***(n.)***.
**strep throat,** قوڕگ ئێشە؛ نەخۆشییەکی درمی قوڕگە. (هەروەها " **septic sore throat** ").
**strepto-** (strep′tə), پێشگرێکە بەمانای: زنجیرەی پێچاوپێچ.
**streptococcus** (strep´tə-kok′əs), *n.* بەکتریایەکی خڕ یا هێلکەییە بە جووت جووت و بە زنجیرە دەردەکەوێ.
**streptomycin** (strep´tə-mī′sin), *n.* ستریپتۆمایسین؛ دەرمانێکە دژە زیندەکانە لە " پەنسلین " دەچێ.
**streptothricin** (strep´tə-thrī′sin), *n.* دەرمانێکی دژە زیندەکانە لە هەندێ کەڕوو دروست دەکرێ.
**stress** (stres), *n.* (١) (أ) پەستان (مەکینەکاری)؛ هێز یا ئەرکی سەر ڕوویەك؛ پەستاوتن. (ب) توندوتیژی ئەم پەستانە یا ئەرکە.
(٢) بایەخ؛ گرنگی؛ بە گرنگی گرتنی شتێك:
***( the misplaced ~ on money)***
(٣) ئەرك (لەسەر هەست، مێشك یا لەش)؛ دەمارگرژی؛ دەمارگیری؛ ناخۆشی:
***( Worry over his job and his wife's health put him under a great ~ .)***
(٤) هێز (مۆسیقا).
(٥) گیرە (ڕێزمان)؛ هێز:
***( In "children" the ~ is on the first syllable.)***
(٦) (أ) هێز (هۆنراوە)؛ گیرە. (ب) بڕگەی هێز لەسەر یا گیراو.
***v.t.*** (١) پەستان؛ پەستاوتن؛ هێز یا ئەرك خستنەسەر (مەکینەکاری).
(٢) بە گرنگ دانان؛ بایەخ پێدان؛ بە توند گرتن؛ دووپاتکردنەوە.
***( He ~ed the importance of hard work, honesty, loyalty,***

*etc.)*
(٣) نەرك خستنەسەر (مێشك، هەست، لەش)؛ پەستكردن؛ باری ناخۆش خستنەسەر شان؛ مەراق پێدان.
(٤) هێز خستنەسەر (ڕێزمان، هۆنراوە)؛ گرتن (برگە):
*( In "truthful" you ~ the first syllable.)*
**-stress** (stris), پاشگرێكە نیشانەی مێینەیە
**stretch** (strech), *v.t.* (١) درێژكردنەوە؛ ڕاكێشان؛ پانكردنەوە؛ كشاندن (لاستیك). (٢) ڕاكێشان (باڵ، قاچ، لاق)؛ پەل لێ ڕاكێشان:
*( to ~ one's legs)*
(٣) ڕاكشان؛ پاڵكەوتن.
(٤) (ا) كرژكردن (ماسولكە). (ب) لە جێ بردن؛ توند ڕاكێشان.
(٥) زۆر لەخۆكردن؛ زۆر پاڵ بەخۆوە نان؛ زۆر هەوڵدان:
*( to ~ every nerve to win)*
(٦) (ا) بەش پێ كردن؛ پێ دەربردن:
*( to ~ the budget by careful spending)*
(ب) زۆرتر كردن بە ڕوونكردنەوە؛ بەشی زیاتر پێ كردن:
*( to ~ a meal by thinning the soup)*
(٧) درێژەپێدان (باس).
(٨) (ا) بەدەمەوەدان: *( He ~ed the rules to suit his purpose.)*.
(ب) پێوەنان؛ زیادە پێوەنان؛ زیادە ڕۆیشتن:
*( She ~ed the facts a little.)*
(٩) [Slang]. بەزەویدادان (زۆرانبازی، بۆكسبازی)؛ ڕاخستن (مەجاز).
(١٠) [Archaic or Dial.]، هەلواسین؛ بە پەتەوە كردن
(١١) [Slang or Dial.]، ڕاكشاندن بۆ ناشتن
*v.i.* (١) (ا) درێژبوونەوە. (ب) كشان؛ ڕاكێشران؛ ڕاكێشان؛ كێش هاتن.
(٢) ڕاكێشان؛ دەست بۆ ڕاكێشان.
(٣) ( ~ **out** ) ، ڕاكشان؛ پەل لێ ڕاكشان؛ خۆ ڕاكشان.
(٤) كشان: *( Rubber ~es easily.)*.
(٥) [Slang]. هەلواسران؛ بە پەتەوە كران.
*n.* (١) درێژبوونەوە؛ درێژكردنەوە؛ كشان؛ ڕاكێشان.
(٢) ماوەی سەروبەر؛ ماوەیەكی بەردەوام؛ سەردەم:
*( a ~ of three months)*
(٣) [Slang]. ماوەی سزای بەندیخانە.
(٤) ماوەی كشان؛ ڕادەی كشان یا درێژكرانەوە.
(٥) شوێنێكی فراوان و بەر بەرەلاّ یا كراوە؛ زەوی درێژبووەوە؛ درێژایی؛ پانتایی:
*( a ~ of land, highway, beach, empty fields )*
(٦) لایەكە لە دوو لا ڕاستەو درێژەكەی مەیانی غارغارێن.
*adj.* بكش؛ لاستیك
**stretcher** (strech'ēr), *n.* (١) (ا) دارێكە لە باری پاڵ خراوی چوارچێوەیەك ڕادەگرێ. (ب) قاڵبی پێلاو ڕاستكردنەوە یا كشان؛ چوارچێوەی جل كشان. (ج) خشتێك یا بەردێكە لە باری درێژی خرابێتە دیوارەوە (٢) دەستەبەرەی نەخۆش.
**stretcher-bearer** (strech'ēr-bâr'ēr), *n.* دەستەبەری نەخۆش هەلگر.
**stretch-out** (strech'out'), *n.* ئیشی زیادە بە كرێكار كردن بە پارەیەكی كەم یا بە خۆڕایی.
**stretchy** (strech'i), *adj.* بكش؛ لاستیكی.
**-stretchiness** ***(n.)***.
**strew** (strōō), *v.t.* (١) پرش وبلاوكردنەوە؛ تۆودان؛ پرژاندن.
(٢) داپۆشینی ڕوویەك بە پرش وبلاوكردنەوەی شت بەسەریدا.
(٣) پەرش و بلاوبوونەوە.
**stria** (strī'ə), *n.* (١) درزی باریك؛ درز؛ قلیشی بچووك.
(٢) میلی باریك (بەتایبەتی كە هاوڕێكی چەند میلێك یا هێڵێكی تر بێ).
**striate** (strī'āt), *v.t.* (١) درزتێكردن؛ قلیش قلیش كردن.
(٢) میل میل كردن.
*adj.* (١) درزاوی؛ قلیشاو. (٢) میل میل.
**striated** (strī'āt-id), *adj.* (١) درزاوی؛ قلیشاو. (٢) میل میل.
**striation** (strī-ā'shən), *n.* (١) درز تێدابوون. (٢) میل میلێتی. (٣) **stria**.
**stricken** (strik'ən), *past participle of* **strike.**
*adj.* (١) بریندار؛ پێكاو؛ گوللە لێدراو؛ لێدراو؛ بەركەوتوو.
(٢) تووش بوو (نەخۆشی، برین، پیری، خەم، نەگبەتی)؛ گرفتار؛ كەفتەكار؛ نەخۆش. (٣) پڕ؛ لیپاولیپ.
**strickle** (strik''l), *n.* (١) ڕێككەر: ئامێرێكی ڕاستە دانەوێڵەی زیادەی پێ لا دەبرێ بۆ لێوان لێو كردنی پێوانەكە؛ دارماڵ.
(٢) ئامێری داس تیژكردن. (٣) ئامێری ڕێك وپێك كردنی داڕشتەی لم.
*v.t.* ڕێك كردن بە ئامێری ڕێك كردن؛ دارماڵ كردن.
**strict** (strikt), *adj.* (١) (ا) توندوتیژ:
*( ~ orders, standards, etc.)*
(ب) بە زەبروزەنگ؛ بەزەبر؛ توندوتیژ: *( a ~ teacher, father, etc.)*.
(٢) (ا) تەواو؛ ئێجگار: *( ~ secrecy )*.
(ب) بەتوندگر؛ توندوتیژ؛ بە ووردی و بە توندی پەیڕەویكەر:
*( a ~ Moslem)*
(٣) تەسك (مانا): *( in the ~ sense of the word)*.
(٤) باریك و ڕەق و بۆ سەرەوە هەڵچوو (ڕووەكناسی).
(٥) [Archaic]، (ا) نزیك (پەیوەندی). (ب) تەسك؛ تەنگ.
-strictness *(n.)*.
**strictly** (strikt'li), *adv.* بە توندوتیژی؛ بە ووردی؛ بە تەواوی؛ بە توندی.
**stricture** (strik'chēr), *n.* (١) ڕەخنەی توند؛ سەرزەنشتی.
(٢) پەیڕەو و شتی توندوتیژو ڕێ لێگر یا بەستەرەوە: *( moral ~s )*.
(٣) [Obs.]، توندوتیژی. (٤) هاتنەوەیەكی بۆری لەش.
**stride** (strīd), *v.i.* (١) هەنگاوی گەورە نان؛ بە هەنگاوی گەورە گەورە ڕۆیشتن (بەتایبەتی بە خێرا یا بە فیزەوە).
(٢) هەنگاوێكی گەورە بەسەردا هەڵهێنانەوە: *( to ~ over a ditch)*.
(٣) (ا) لنگێ لەم دیو و لنگێ لەو دیوەوە دانان (وەك سواربوونی ئەسپ)؛ دانیشتن یا وەستان بەم جۆرە. (ب) وەستان بە لاق بلاوی.
*v.t.* (١) هەنگاوێكی گەورە بەسەردا هەڵهێنانەوە.
(٢) پێدا ڕۆیشتن بە هەنگاوی گەورە ( هەر وەك پێوانی شوێنێك بە هەنگاو):
*( They ~ the street.)*
(٣) دانیشتن یا وەستان بە كەڵ بلاوی؛ لاق خستنە ئەم دیوو ئەودیوی شتێكەوە لە دانیشتن یا وەستاندا.
*n.* (١) هەنگاوی گەورە نان یا هەڵهێنانەوە. (٢) هەنگاوی گەورە.
(٣) هەنگاوی گیانداری چوارپێ. (٤) ماوە یا درێژی ئەم جۆرە هەنگاوە.
(٥) (*pl.*) ، پێشكەوتن.
**hit one's stride,** گەیشتنە پلەی ئاسایی چالاكی و كاریگەری خۆ.
**make great strides,** زۆر پێشكەوتن؛ هەنگاوی گەورە یا باش نان بۆ پێشەوە.
**take in one's stride,** بە ئاسانی كردن؛ بە ئاسانی جێبەجێكردن یا ئەنجام دان.
**stridence** (strī'd'ns), *n. Also* **stridency,** بەرزی و تیژی و ناسازی (دەنگ).
**strident** (strī'd'nt), *adj.* بەرز و تیژو ناساز (دەنگ).
**-stridently** ***(adv.)***.
**stridor** (strī'dēr), *n.* (١) دەنگێكی تیژو ناساز.
(٢) دەنگێكی ناخۆشی هەناسەدانە وەك خیزە یا لوورە (پزیشكەوانی).
**stridulate** (strij'oo-lāt'), *v.i.* جریوەجریوێكی ناساز كردن (وەك هەندێك جانەوەر).
**-stridulation** ***(n.)***.
**stridulous** (strij'oo-ləs), *adj.* جریوەجریوی؛ تیژو ناساز.

**strife** (strīf), ***n.*** (١) ناكۆكی؛ ڕقەبەری؛ ڕقەبەرایەتی؛ دووبەرەكی.
(٢) [Archaic]، هەوڵ؛ كۆشش؛ خەبات.

**strigil** (strij′əl), ***n.*** (١) ئامێرێكی دەم چەماوەیە یۆنانیو ڕۆمانەكان
بەكاریان دەهێنا بۆ سڕینی پێست لە دوای گەرماو یا وەرزش كردن.
(٢) نەخشێكی شەپۆلی خانوو ڕازێنەرەوەی ڕۆمانییە.

**strigose** (strī′gōs, stri-gōs′), ***adj.*** (١) درکاوی (گەڵا)؛
توو‌كەكەی تیژە (ڕووەكناسی). (٢) درزاوی (گیانەوەرناسی)؛ قلیش قلیش.

**strike** (strīk), ***v.t.*** (١) (ا) پیادان؛ پیامالین؛ لێدان؛ زرمە لێ هەڵسان؛
پیاكێشان ***( to ~ someone with hand)*** .
(ب) پیاكێشان؛ لێدان: ***( He ~ the nail with a hammer.)*** .
(ج) لێدان (سكە): ***( A mint ~s coins.)*** .
(٢) ماسی گرتن بە ڕاتەكاندن یا ڕاكێشانی قولاپەكە.
(٣) لێدان (ئامێری مۆسیقا): ***( to ~ a key )*** .
(٤) لێدان (كاتژمێر).
(٥) پیادان؛ بە توند بەركەوتن؛ پیامالین:
***( She ~ her elbow against the door.)***
(٦) لێدان (شقارتە)؛ داگیرساندن: ***( He struck a match.)*** .
(٧) لێدان. ***( The stone struck his head.;***
***The lightning struck the chimney.)***
(٨) هێرش بردنە سەر؛ دەست وەشاندن.
(٩) (ا) لێدان؛ بەركەوتن: ***( The light struck the window.)*** .
(ب) بەر گوێ كەوتن؛ بیستن.
(١٠) دۆزینەوە (لەپڕ): ***( They struck oil.)*** .
(١١) دەركەوتن: ***( What a sight struck my eyes.)*** .
(١٢) (ا) هاتن بە مێشكدا یا بە خەیاڵدا: ***( The idea just struck me.)*** .
(ب) دڵفڕاندن.
(ج) وا بۆ دەركەوتن؛ وا دیاربوون: ***( That ~s me as rather silly.)*** .
(د) لە پڕ وا لێ هاتن: ***( He was struck dumb.)*** .
(هـ) هەست جووڵاندن: ***( The scream ~ terror in my heart.)*** .
(١٣) (ا) بەستن (پەیمان)؛ ڕێكەوتن؛ پێكهاتن: ***( to ~ a bargain)*** .
(ب) گەیشتنە: ***( to ~ a balance)*** .
(١٤) داگرتن (ئاڵا، بایەوان)؛ هێنانەخوارەوە؛ نزم كردنەوە.
(١٥) لابردنی دانەوێڵەی زیادەی پێوانەیەك بە ئامێرێكی ڕاست بۆ ڕێك كردنی
لەگەڵ لێواری پێوانەكە. (ووشەی " strickle " ببینە).
(١٦) هەڵوێستێكی تایبەتی وەرگرتن. (١٧) ڕەگ داكوتان.
(١٨) [Slang]، لێ قەرزكردن؛ داوالێكردن.
(١٩) [Obs.]، جەنگاندن؛ جەنگ كردن؛ شەڕكردن.
(٢٠) سڕینەوە؛ لابردن: ***( He ~ her name from the list.)*** .
(٢١) (ا) لابردنی كەرەسەی پەردە (شانۆگەری).
(ب) چرا كزكردن یا كوژاندنەوە (شانۆگەری).

***v.i.*** (١) پیادان؛ پیامالین؛ لێدان؛ پیاكێشان.
(٢) هێرش بردن؛ دەست وەشاندن: ***( The enemy ~ at dawn.)*** .
(٣) (ا) لێدان (كاتژمێر، زەنگ): ***( The clock is ~ing.)*** .
(ب) بانگ بۆ دان بە لێدانێكی وەها: ***( Three o'clock had struck .)*** .
(٤) پیادان؛ پیاكێشان؛ لێدان
***( The ball struck against the house.)***
(٥) داگیرسان: ***( This match won't ~ .)*** .
(٦) دان خواردن (ماسی لە ڕاوەماسیدا). (٧) پێوەدان (مار).
(٨) چوونەژوورەوە؛ پیاچوون:
***( The wind struck through the cracks.)***
(٩) ( **~ on; ~ upon** )، دۆزینەوە:
***( We struck on the right combination.)***
(١٠) بایەوان داگرتن یا نزم كردنەوە.
(١١) ئاڵا داگرتن (نیشانەی بەزین).
(١٢) مان گرتن: ***( The workers struck yesterday.)*** .
(١٣) ڕووان؛ ڕەگ داكوتان.
(١٤) لادان بەرەو؛ ڕۆیشتن بەرەو شوێنێكی تازە: ***( They struck north.)*** .
(١٥) تێ تەقاندن؛ بە تیژ ڕۆیشتن.

***n.*** (١) لێدانێك؛ پیاكێشانێك؛ پیامالینێك؛ پیادانێك.
(٢) **stickle** .
(٣) مانگرتن: ***( a miner's ~ ; The teachers went on a ~ .)***
(٤) لە پڕ دۆزینەوەی نەوت، كانزا... هتد.
(٥) شانس گرتنێكی باش؛ سەركەوتنێكی لە پڕو پارەیەكی زۆر دەسكەوتن.
(٦) دان خواردنی ماسیو یاری كردن بە قولاپەكە.
(٧) ژمارەی پارەی سكە لێدراو بە جارێك.
(٨) هێرشی فڕۆكەی بۆمباهاوێژ (بەتایبەتی بۆ سەر نیشانێكی تایبەتی
(٩) لێ نەدانی تۆپی یاری "بێسبۆڵ" كە بە هەڵە دەژمێررێ
(١٠) لێدانی هەموو نیشانەكان لە یاری "بۆلینگ"داو خستنە خوارەوەیان.
(١١) كۆسپ؛ بارێكی نەهات، نالەبار، یا ناهەموار:
***( His ethnic background was a second ~ against him.)***

**be struck with,** سەرنج ڕاكێشران؛ دڵفڕان:
***( He was struck with his beauty and intelligence.)***

**have two strikes against one,** [Colloq.], لە بارێكی ناهەموار یا
نالەباردا بوون.

**(out) on strike,** مانیان گرتووە

**strike down,** (١) لێدانو خستن؛ پیاكێشانو بەزەویدادان.
(٢) خستن (نەخۆشی)؛ كەفتەكاركردن.

**strike dumb,** واق ووڕماندن؛ سەرسام كردن؛ سەرسوڕماندن.

**strike in,** قسە پێ بڕین؛ هەڵدانە قسە.

**strike it rich,** (١) لە پڕ نەوت یا كانزای بەنرخ دۆزینەوە.
(٢) لە پڕ دەوڵەمەندبوون؛ لە پڕ پارەیەكی زۆر دەسكەوتن.

**strike off,** (١) لێكردنەوە؛ بڕین؛ پەڕاندن (سەر):
***( to strike off a person's head.)***
(٢) سڕینەوە؛ لابردن؛ لێ دەرهێنان.
(٣) چاپ كردن.

**strike out,** (١) دەست لێ وەشاندن؛ لێدان.
(٢) دانان؛ دامەزراندن؛ پێكهێنان. (٣) سڕینەوە؛ لابردن؛ كوژاندنەوە (ناو).
(٤) دەستپێكردن (كار، ڕۆیشتن).
(٥) دەركردن (یاریكەری بێسبۆڵ لەبەر سێ هەڵەكردن).

**strike up,** (١) دەستپێكردن (گۆرانی ووتن، مۆسیقا لێدان).
(٢) دەستپێكردن (برادەری)؛ پێكهێنان:
***( The two boys struck up a friendship.)***

**strike-bound** (strīk′bound´), ***adj.*** مانگرتن دایخستوە یا
ئیشی ڕاگرتووە (كارگە).

**strike-breaker** (strīk′brāk´ẽr), ***n.*** مانگرتن شكێن: كەسێكە كە
لە جێی كرێكاری مانگر كاردەكات بۆ پووچ كردنەوەی مانگرتنەكە.

**strike-out** (strīk′out´), ***n.*** لە یاری دەركردنی تۆپ لێدەری بێسبۆڵ
لەبەر سێ هەڵە

**striker** (strīk′ẽr), ***n.*** (١) مانگر؛ كرێكاری مانگر.
(٢) شاگرد ئاسنگەر؛ ئاسنكوت.
(٣) بزماری تەقە (چەكی ئاگرین).
(٤) چەكوشی كاتژمێر. (٥) سەربازی بەردەستی ئەفسەر.
(٦) ڕم هاوێژی ڕاوە نەهەنگ.

**striking** (strīk′iŋ), ***adj.*** سەرنج ڕاكێش؛ سەرسوڕمێنەر:
***( a woman of ~ beauty)***

**string** (striŋ), ***n.*** (١) بەن؛ دەزوو؛ كشتەك؛ ڕایەڵ؛ تاڵ؛ تاڵە دەزوو یا
بەن؛ تەل؛ سیم. (٢) قەیتان. (٣) ڕست؛ چەند شتێكی لە كشتەك یا تەل
هەڵكێشراو یا هۆنراوە (موروو، دەنكە تەزبیح... هتد): ***( a ~ of beads)*** .
(٤) ڕیز؛ زنجیرە؛ ڕست: ***( a ~ of houses)*** .
(٥) دەستەیەك یاریكەری بەپێی توانا ڕیزكراو؛ نمرە؛ پلە:

*( The second ~ will play today.)*
(٦) (ا) ژێ (نامێری مۆسیقا).
(ب) (*pl*) ، هەموو نامێری ژێداری ئۆرکسترایەك.
(ج) (*pl*) ، ئەوانەی نامێری ژێدار دەژەنن.
(٧) (ا) [Obs.]، ماسولكەی ژێ یا هەستەدەماری گیاندار.
(ب) ڕیشاڵ (بەتایبەتی هی كەلووی لۆبیای سەوز).
(٨) [Colloq.]، مەرجی شاراوە: *( a gift with no ~s attached)* .
(٩) (ا) سنگی نەردە. (ب) **stringcourse**
(١٠) هێڵی سەر مێزی بلیارد (كە لە سەرەتای هەموو یارییەكەوە تۆپی دەسكەلای لێوە تێ دەگیرێتە تۆپەكانی تر)
(١١) سەرجەمی ئەسپی كەسێك (غارغارێن یا پێشبڕكێی ئەسپ).
*v.t.* (١) هۆنینەوە (تەزبیح، مووروو)؛ ڕستكردن (بامیە، گەڵا توتن).
(٢) بە پەت بەستنەوە یا توندكردنەوە؛ بە پەتا كردن؛ هەڵواسین.
(٣) ژێ سازكردن یا توندكردنەوەی نامێری ژێدار.
(٤) توندكردنەوە؛ قایم كردن
(٥) وورووژان؛ هێنانەجۆش؛ شڵەژاندن؛ دەمار كرژكردن.
(٦) ڕیشاڵ لێ دەرهێنان (لۆبیای سەوز)
(٧) ڕیزكردن (٨) كشاندن؛ ڕاكێشان
(٩) (~ **along**)، فێڵ لێكردن؛ خەڵەتاندن؛ ساختەلێكردن.
*v.i.* (١) وەك دەزوو یا بەن لێ هاتن؛ تاڵ تاڵ وەستان.
(٢) ڕیزبوون؛ زنجیرە بەستن؛ كشان لە شێوەی هێڵێكدا.
**harp on one string (or harp on the same string),** هەر ووتن و ووتنەوەی باسێك و نەبڕینەوەی؛ هەر یەك شت لەسەر زمان بوون.
**pull strings,** دەسەڵاتی خۆ بەكارهێنان بە دزییەوە بۆ كاركردنەسەر ئەنجامی شتێك
**string along,** (١) شوێن كەوتن؛ پاشڕەوی كردن؛ پاشكۆیی كردن.
(٢) بەتەماكردنی شتێك یا كارێك كردن و بۆ نەكردن؛ بە دەمەوە گرتن.
(٣) خەڵەتاندن؛ فێڵ لێكردن؛ ساختەلێكردن.
**string up, [Colloq.].** هەڵواسین؛ بەپەتەوەكردن.

**string bean,** (١) برە لۆبیا
(٢) لۆبیای سەوز؛ كەلووە لۆبیا.
(هەروەها پێشی دەووترێ: " **snap bean** ").
(٣) [Slang]. كەسێكی قەد بارێك و باڵابەرز.

**string-board** (striŋ′bôrd´, striŋ′bōrd´), ***n.*** تەختەی قەراغ پلەی پێ پێلكە.

**stringcourse** (striŋ′kôrs´, striŋ′kōrs´), ***n.*** ئەخشێكی بارێكی خشت، بەرد، یا دارە بە دەوری دیواری خانوویەكدا.

**stringed** (striŋd), ***adj.*** (١) ژێدار (نامێری مۆسیقا)
(٢) بە نامێری ژێدار لێدراو *( ~ music )* .
(٣) بە بەن یا تەل بەستراوە یا پێچراوەتەوە؛ كراوە بە تەلەوە؛ بە تەل هۆنراوەتەوە

**stringed instrument,** نامێری ژێدار.

**stringency** (strin′jən-si), ***n.*** (١) توندوتیژی
(٢) پارە كەمی (لە بانق یا بازاڕدا بۆ قەرزدان بە خەڵك)
(٣) بە هێزی بەڵگە (بۆ پێ سەلماندنی شتێك)

**stringent** (strin′jənt), ***adj.*** (١) توندوتیژ (یاسا، پەیڕەو، مەرج):
*( ~ laws against smoking)*
(٢) گیر (بازاڕی پارە)؛ بێ پارەو قەرزنەدەر (بانق، میری... هتد)؛ سەخت (باری دارایی وولات و بانق و بازاڕ).
(٣) پێ سەلمێنەر (بەڵگە)؛ بەهێز (بەڵگە): *( ~ arguments )* .

**stringer** (striŋ′ēr), ***n.*** (١) بكەری **string** .
(٢) (ا) ئیرگە؛ دەستەك. (ب) **stringboard**
(ج) داری درێژی ژێر هێڵی شەمەندەفەر (لە باری درێژی)
(٣) كەسێكی پلە ئەوەندەی تیپێك: *( a second- ~ )* .
(٤) نوێنەری ڕۆژنامەیەك لە دەرەوەی شار یا وولات

**string-halt** (striŋ′hôlt´), ***n.*** شەلی و بەگیروەستانی پاشووی ئەسپ (هەروەها " **spring-halt** ").

**string piece** (striŋ′pēs´), ***n.*** پارچە دارێكی درێژە چوارچێوەیەك ڕادەگرێ.

**string quartet,** (١) تیپێكی مۆسیقای چواركەسی نامێری ژێدارە.
(٢) مۆسیقای تیپێكی وەها.

**string tie,** بۆینباخێكی زۆر بارێكە وەك تاڵە بەن هەندێك جاریش دووفاقە.

**stringy** (striŋ′i), ***adj.*** (١) دەزوویی؛ بارێك و درێژ؛ تەلی.
(٢) ڕیشاڵی؛ لە ڕیشاڵ پێكهاتوو. (٣) جیڕ؛ ڕیشاڵ یا دەمار جیڕ (گۆشت).
(٤) لینج؛ یەككگرتوو: *( ~ syrup )* .
-**stringiness** *(n.)*.

**strip** (strip), ***v.t.*** (١) (ا) ڕووتكردنەوە.
(ب) جل داكەندن؛ جل لەبەر داكەندن:
*( He ~ed the shirt from his back.)*
(٢) (ا) لێسەندن؛ بێ بەش كردن؛ لێسەندنەوە:
*( to ~ a persons of his honors, titles, etc.)*
(ب) ڕووتكردنەوە؛ تاڵان كردن.
(٣) داماڵین؛ پێست یا توێكڵ لێكردنەوە.
(٤) (ا) ڕنین (میوە، گەڵا... هتد)؛ لێكردنەوە؛ ڕووتكردن:
*( We ~ed the fig tree.; The locusts ~ed the fields.)*
(ب) ڕووتكردن؛ لێ لابردن: *( We ~ed the room of furniture.)* .
(٥) ڕووتكردن (چەكی ئاگرین بۆ پاكردنەوەی)؛ هەڵوەشاندن.
(٦) دان سوواندن (پێچ و مۆرە، ڕەوڕەوەی داندار):
*( to ~ a nut, bolt, screw, etc.)*
(٧) دۆشینی مانگا تا دوا دڵۆپ؛ چۆڕاندنەوەی گوانی مانگا.
(٨) لێكردنەوەی دەماری ناوەڕاستی گەڵا توتن لە گەڵاكە خۆی
(٩) جیاكردنەوەی تۆخمەكانی ناوێتەیەك لە یەكتری.
*v.i.* (١) خۆ ڕووتكردنەوە پارچە پارچە لەسەر شانۆ لەبەر چاوی تەماشاكەران
(٢) توێك فڕێدان؛ توێخ لێبوونەوە.
*n.* = striptease.

**strip** (strip), ***n.*** (١) تیلماسك؛ تیلمە؛ تیرە؛ پارچەی بارێك و تەنك و درێژكۆلە (دار، قوماش، گۆشت، زەوی... هتد)؛ توێ؛ توێژاڵ؛ قاش.
(٢) **comic strip** .
(٣) فڕگە؛ شوێنی فڕین و نیشتنەوەی فڕۆكە. (هەروەها پێی دەڵێن: " **air strip** " وە " **landing strip** ").
(٤) ڕیزە پوول (سێ یا زیاتر).
*v.t.* كردن بە پارچە پارچەی بارێك و تەنك و درێژكۆلەوە؛ قاش كردن؛ توێ توێ كردن.

**stripe** (strīp), ***n.*** (١) میل (قوماش)؛ هێڵ.
(٢) شوێنی قامچی لێدان؛ نیشانەی هەڵتلۆقاوی سەر پێست (وەك قامچی)
(٣) لێدان (بە قامچی... هتد).
(٤) هێڵی سەر باڵی سەربازو پۆلیس.
(٥) نیشانەی تایبەتی. (٦) جۆر؛ چەشن؛ بابەت.
*v.t.* میل میل كردن؛ هێڵ پیاهێنان.

**striped** (strīpt, strī′pid), ***adj.*** میلدار (قوماش)؛ میل میل؛ بەڵەك؛ بازوو.

**striped bass,** جۆرە ماسییەكی بازووە.

**striper** (strīp′ēr), ***n.*** (١) باڵباز: سەربازێكە كە چەند هێڵ یا نیشانێك بەسەر قۆڵییەوە بێت. (٢) [Colloq.]، **stripe bass** .

**stripling** (strip′liŋ), ***n.*** لاو؛ هەرزە؛ گەنج؛ جوان.

**strip mining,** كانزاكردن لە ڕووی زەویدا لەباتی قووڵایی زەوی (بەتایبەتی خەڵوون)؛ ڕووتكردنی ڕووی زەوی بە كانزاكردن.

**stripper** (strip′ēr), ***n.*** **[Slang],** ئافرەتی خۆڕووتكەرەوە پارچە پارچە لەسەر شانۆ لەبەر چاوی تەماشاكەران. (هەروەها " **stripteaser** ")

**stript** (stript), *rare past tense and past participle of* **strip.**

**striptease,** *Also* **strip tease,** خۆ ڕووتکردنەوەی ئافرەت پارچە
پارچە لەسەر شانۆ لەبەر چاوی تەماشاکەران.
**stripteaser,** ئافرەتی خۆڕووتکەرەوە پارچە پارچە لەسەر شانۆ
لەبەرچاوی تەماشاکەران. (هەروەها " **stripper** ").
**stripy** (strīp′i), *adj.* بەڵەك؛ بازوو؛ میلدار.
**strive** (strīv), *v.i.* (١) کۆشش کردن؛ هەوڵدان؛ ڕەنج دان:
*( They ~ to win.)*
(٢) خەبات کردن *( to ~ against oppression)* .
(٣) [Obs.]، ملەملێ کردن.
**strobila** (strob′i-lə), *n.* لەشی کەرت کەرتی وەك کرمی شریتی.
**strobile** (strob′il), *n.* بەری قوورچکەیی تۆودار وەك بەری کاج.
**stroboscope** (strob′ə-skōp′), *n.* ئامێری پێوانی خێرایی
سووڕانەوە و لەرینەوە.
-**stroboscopic** *(adj.)*; **stroboscopical** *(adj.)*.
**strode** (strōd), *past tense of* **stride.**
**stroke** (strōk), *n.* (١) لێدان (تەور، قامچی... هتد)؛ پیادان.
(٢) (ا) کارێکی توندو لەپڕی ئەنجام بەخش وەك لێدان:
*( a ~ of lightning)*
(ب) کارێکی ئەنجام بەخش بەتایبەتی هی خۆش: *( a ~ of luck)* .
(٣) مێشك وەستان؛ مێشك ووشك بوون؛ سەکتەی مێشك؛ شەپلە؛ گۆجی؛
ئیفلیجی ٤) (ا) هەوڵێکی سەرکەوتوو. (ب) ئەنجامی هەوڵێکی وەها.
(٥) (ا) دەنگی لێدانی کاتژمێر.
(ب) کات یا ساتی ئەم لێدانە: *( He arrived at the ~ of nine.)* .
(٦) (ا) لێدان بە دەست، گورز، یا ڕاکێت (یاری تەنس، گۆلف، بلیارد... هتد).
(ب) باڵ هەڵهێنانەوە (مەلە، سەوڵ لێدان):
*( the ~ of a swimmer, rower, etc.)*
(ج) جۆرو خێرایی ئەم باڵ هەڵهێنانەوەیە: *( a slow ~ )* .
(٧) هێڵ یا نیشانە (بە پێنووس یا ئامێری تر).
(٨) لێدانی دڵ
(٩) دەست پێداهێنان؛ لێخشان؛ پیاخشان.
(١٠) کایە (مەکینەکاری).
(١١) کارێك یا بیرێکی لێهاتووانە: *( a ~ of genius )* .
(١٢) (ا) سەوڵ لێدەری پشتەوەی بەلەم (کە خێرایی بەلەمەکەی بەدەستە).
(ب) جێی ئەم سەوڵ لێدەرە.
*v.t.* (١) دەست پێداهێنان؛ بە ئەسپایی لێخشان:
*( He ~ her hair, back, etc.)*
(٢) دانانی خێرایی سەوڵ لێدان.
**stroke oar,** (١) سەوڵی پشتەوەی بەلەم.
(٢) سەوڵ لێدەری پشتەوەی بەلەم (کە خێرایی بەلەمەکەی بەدەستە).
**stroll** (strōl), *v.i.* پیاسەکردن؛ گەڕان: *( to ~ in the park)* .
*v.t.* پیاسە پێداکردن؛ پێداگەڕان: *( to ~ the streets)* .
*n.* پیاسە؛ گەڕانێکی لەسەرخۆ: *( to go for a ~ )* .
**stroller** (strōl′ēr), *n.* (١) پیاسەکەر
(٢) نوێنەری گەڕۆك (شانۆگەری).
(٣) لانەواز؛ خانە بە کۆڵ؛ گەڕۆك؛ گەڕیدە؛ ڕەبەن؛ وێڵ.
(٤) ڕەوڕەوەی منداڵ.
(٥) گالیسکە یا عەرەبانەی منداڵ.
**stroma** (strō′mə), *n.* (١) شانەی پێکهێنەری چوارچێوەی ئەندامێك
یا خانەیەك. (٢) چوارچێوەی بێ ڕەنگی خڕۆکەی سووری خوێن.
-**stomatic** *(adj.)*.
**stromeyerite** (strō′mī′ēr-īt′), *n.* ستڕۆمایرایت: کانزایەکی
بریقەداری خۆڵەمێشی‌یە.
**strong** (strôŋ), *adj.* (١) (ا) بەهێز؛ تۆکمە. (ب) تەندروست؛ بەگوڕ.
(٢) ڕەوشت بەرز؛ وورە بەرز: *( a man of ~ character)* .
(٣) لێهاتوو؛ بەتوانا؛ زیرەك: *( He's ~ in chemistry.)* .
(٤) قایم؛ پتەو؛ بەرگەگر: *( a ~ wall)* .
(٥) زۆر بەرگەگر (هێرش)؛ خۆڕاگر؛ بە ئاسانی نەگیراو (سەنگەر):
*( a ~ fort)*
(٦) بەهێز: *( a ~ army )* .
(٧) لە ژمارەیەکی تایبەتی پێکهاتووە و ئەختێك زیاتریش:
*( an army of 6,000 ~ )*
(٨) توندوتیژ؛ بەزەبر: *( ~ measures )* .
(٩) خەست؛ خەلیس؛ سەنگین: *( a ~ drink, coffer, tea, beer, etc.)*
(١٠) توندوتیژ؛ بەهێز؛ تیژ: *( a ~ light, smell, etc.)* .
(١١) بۆگەن؛ بۆن تیژ
(١٢) بەرز؛ قایم *( a ~ voice)*
(١٣) (ا) بەتین؛ گەرم؛ زۆر: *( ~ affection)*
(ب) پێ سەلمێنەر؛ توند: *( ~ opinion )* .
(ج) توندوتیژ؛ ڕەق: *( ~ criticism, language, words, etc.)*
(١٤) بەزەبر؛ زاڵ: *( a ~ personality)* .
(١٥) زۆر دیار؛ ئەوتۆ؛ زۆر: *( a ~ resemblance between the two)* .
(١٦) توند؛ قایم؛ بەتین: *( a ~ wind )* .
(١٧) بەتین (بازاڕی پارە بازی... هتد)؛ نرخ لە چوونە سەرەوەدایە:
*( a ~ market )*
(١٨) بەهێز (کردار- ڕێزمان)؛ نایاسایی؛ نادەستووری:
*( "Swim", "go", and "write" are ~ verbs.)*
(هەروەها پێشی دەوترێ: " **irregular** ")
*adv.* بە توند؛ بە قایم؛ بە توندوتیژی؛ بە هێزەوە؛ ئێجگار؛ زۆر.
**strong-arm** (strôŋ′ärm′), *adj.* [Colloq.], زۆرەملێ؛
زۆردارەکی: *( ~ tactics )*
*v.t.* [Colloq.], زۆرلێکردن؛ بەزۆر پێ کردن
**strong-box** (strôŋ′boks′), *n.* سندووقی قایمی شتی بەنرخ
**strong drink,** خواردنەوەی مەستکەری خەست.
**strong-hold** (strôŋ′hōld′), *n.* قەڵا؛ سەنگەر.
**strongly** (strôŋ′li), *adv.* بەتوند؛ زۆر:
*( I ~ advise you not to go.)*
**strongman** (strôŋ′mən), *n.* (١) بەدەسەڵاترین کەسی ڕێکخراوێك.
(٢) دیکتاتۆر
**strong-minded** (strôŋ′min′did), *adj.* (١) مێشك تیژ
(٢) ڕای توندی خۆی هەیە؛ کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ بە ئاسانی واز لە بیروڕای
خۆ ناهێنێ.
-**strong-mindedly** *(adv.)*; **strong-mindedness** *(n.)*.
**strong-willed** (strôŋ′wild′), *adj.* = **strong-minded.**
**strongyle. strongyl** (stron′jil), *n.* جۆرە کرمێکی خڕی
مشەخۆری زیانبەخشە لە لەشی مرۆڤ و گیانداردا دەژی.
**strontia** (stron′shi-ə), *n.* ئۆکسیدی سترۆنتیۆم (کیمیا).
**strontium** (stron′shi-əm), *n.* سترۆنتیۆم: توخمێکی کانزایی‌یە
(کیمیا).
**strop** (strop), *n.* (١) قایش. (٢) چەرمی چەقۆ و گوێزان تیژکردنەوە
*v.t.* تیغ تیژکردنەوە بە چەرم.
**strophanthin** (strō-fan′thin), *n.* سترۆفانتین: ئارێتەیەکی سپی
یا زەردباوی ژەهراوی‌یە بۆ ووریاکردنەوەی دڵ بەکاردەهێنرێت
**strophe** (strō′fi), *n.* (١) سترۆفی: (ا) گەڕانەوەی دەستەی گۆرانی
چیرۆکی شانۆگەری یۆنانی لە لای ڕاستی شانۆوە بۆ لای چەپ
(ب) ئەو بەشەی چیرۆکی شانۆگەری‌یە کە ئەم دەستە گۆرانی‌یە دەیڵێن لە
چوونیان لە لای ڕاستی شانۆوە بۆ لای چەپ. (٢) برگەی هەڵبەست.
-**strophic**; **strophical** *(adj.)*.
**strophulus** (strof′yoo-ləs), *n.* مەلاریای منداڵ.
**strove** (strōv), *alternative past tense of* **strive.**
**struck** (struk), *past tense and past participle of* **strike.**

*adj.* داخراوه بەهۆی مانگرتنەوە.

**structural** (struk′chēr-əl), *adj.* (١) هی پێکهاتن؛ تایبەتی بە پێکەوەنان (٣) پێویستە بۆ دروستکردن (خانووسازی).
(٢) تایبەتی بە گۆڕینی بەردو چینی سەروەی زەمین (زەمیناسی).
(٤) تایبەتی بە پێکهاتنی لەشی زیندەوەر.

-structurally *(adv.)*.

**structural steel,** پۆڵای خانووکردن.

**structure** (struk′chēr), *n.* (١) شێوەی پێکەوەنان یا پێکهاتن؛ شێوەی دارشتن. (٢) شتی دروستکراو؛ خانوو، پرد.
(٣) پێکهاتن؛ دارشتن: *( the ~ of society )*.
(٤) شتی پێکهاتوو لە چەند بەشێك.

*v.t.* پێکهێنان؛ پێکەوەنان؛ دروستکردن؛ ڕێکخستن.

**structured** (struk′chērd), *adj.* بە شێوەیەکی تایبەتی پێکهاتوو یا ڕێکخراو؛ ڕێکخراو؛ بە پێی پەیرەو ڕێکخراو
*( a ~ environment, class, society, etc.)*

**strudle** (strōō′d'l), *n.* شیرینییەکە بریتییە لە میوەی سێو یا پەنیری خراوە ناو پارچە نانی هەویرو لێنانی لەناو فرندا.

**struggle** (strug′'l), *v.i.* (١) زۆران گرتن؛ ئەمبازبوون؛ کێش مەکێش.
(٢) تێکۆشان؛ هەوڵدان؛ کۆشش کردن؛ خەبات کردن؛ هەڵپەکردن؛ پەلەقاژێ کردن.
*( She ~d to succed in business.; They ~d for freedom all their lives.)*

*n.* (١) تێکۆشان؛ خەبات؛ هەوڵ؛ کۆشش؛ تێکۆشین.
(٢) زۆرانبازی؛ زۆران؛ ناکۆکی؛ شەڕ؛ کێش مەکێش.

**strum** (strum), *v.t. & v.i.* (١) باری بە ژێی ئامێری مۆسیقا کردن؛ بە لاسەرلایی یا نەزانانە ئامێری ژێدار لێدان.
(٢) ئاواز لێدان بەم شێوەیە

**struma** (strōō′mə), *n.* (١) هەئاوسانێکی بنی هەندێ قەوزەیە
(٢) (أ) scorfula (ب) goiter.

-strumose; strumous *(adj.)*.

**strumpet** (strum′pit), *n.* قەحبە؛ ئافرەتی سووك.

**strung** (struŋ), *past tense and alternative p.p. of* string.

**strut** (strut), *v.i.* خۆبادان؛ خۆفشکردنەوە وەك عەلەشیش لە ڕۆیشتندا؛ بە کەش‌وفشەوە ڕۆیشتن؛ بە قنج‌وقیتی ڕۆیشتن بەڕێوە.

*v.t.* پاڵپشت دانەبەر؛ لەنگەرگرتن.

*n.* (١) خۆبادان؛ خۆفشکردنەوە وەك عەلەشیش لە ڕۆیشتندا؛ بە کەش‌وفشەوە ڕۆیشتن. (٢) پاڵپشت؛ کۆڵەکە؛ گۆشەی پاڵپشت.

**struthious** (strōō′thi-əs), *adj.* وشترمەلی؛ تایبەتی بە وشترمەل‌و باڵندەی نەفری تر.

**strychnine, strychnin** (strik′nin), *n.* ستركنین ماددەیەکی ژەهراوییە.

**stub** (stub), *n.* (١) بنکەدار؛ بنك؛ کۆتکەدار؛ کۆتەرە؛ پاشماوەی قەدی درەخت دوای بڕینەوە؛ بنج (٢) قنچك؛ قنگ (جگەرە، پێنووس)؛ کۆلکە؛ کۆلك:
*( the ~ of a tail, cigar, tree root, pencil, etc.)*
(٣) چوکلە؛ نووکی دەرپۆقیو
(٤) تەنەمێکی کۆڵ؛ تەنەمی نووك کورت‌و کۆڵ
(٥) stub nail (٦) قنگە چەك‌و بلیت

*v.t.* (١) لە ڕەگ‌و ڕیشە دەرهێنانی گیا.
(٢) زەوی پاکردنەوە لە بنکە دارو بنجە گیا... هتد بە لە ڕەگ دەرهێنانیان.
(٣) پێ لە شت هەڵکەوتن؛ قاچ بەرکەوتن. (٤) قنگە جگەرە کوژاندنەوە بە پێ.

**stubble** (stub′'l), *n.* (١) پەرێز؛ پاشماوە یا بنجی ناو زەوی دەغڵ‌ودان پاش دروێنە؛ کۆتەرەی گەنم‌و جۆو گەنمەشامی
(٢) شتی کورتەبالای تیژ؛ ڕیشی زبر (پاش نەتاشینی بۆ چەند ڕۆژێك):
*( a ~ of beard )*

**stubbly** (stub′li), *adj.* (١) لە پەرێز دەچێت؛ بە کۆتەرەی دەغڵ‌ودان داپۆشراوە (٢) کورت‌و تیژ.

**stubborn** (stub′ērn), *adj.* (١) کەللەڕەق؛ سەرسەخت؛ قیرسچمە؛ سەرکێش؛ چەمووش؛ مانگر؛ سەرپێچ؛ ڕق ئەستوور.
(٢) کۆڵنەدەر؛ بەردەوام.
(٣) (ا) ڕەق (زەوی): *( ~ soil )*.
(ب) گران (کار، کێشە)؛ بە زەحمەت چارەسەرکراو.

-stubbornly *(adv.)*; stubbornness *(n.)*.

**stubby** (stub′i), *adj.* (١) (ا) کورت‌و ئەستوور؛ کۆتەرەیی:
*( ~ fingers )*
(ب) کۆڵ؛ کورت‌و کۆڵ.
(٢) کورت‌و چڕ (ڕیش، قژ).
(٣) بە شتی کورت‌و چڕ داپۆشراو.

**stub nail,** بزماری کورت‌و ئەستوور.

**stucco** (stuk′ō), *n.* (١) گەچ؛ قسل‌و گەچ. (٢) گەچکاری.

*v.t.* گەچکاری کردن؛ بە گەچ سواغ دان: *( to ~ a wall )*.

**stuccowork** (stuk′ō-wūrk′), *n.* گەچکاری.

**stuck** (stuk), *past tense and p.p. of* **stick**.

**stuck-up** (stuk′up′), *adj.* [Colloq.], لووت بەرز؛ لەخۆبایی؛ بەفیز؛ بە کەش‌وفش.

**stud** (stud), *n.* (١) قرتێنە؛ قرتێنکە؛ دوگمە یا تەرەقەی قەڵغان.
(٢) دیرەك؛ داری بە پێوەی دیوار (لە خانووی داردا)؛ داری ڕاوەستاوی چوارچێوەی خانوو. (٣) سنگ (بە دیوارەوە)؛ پاڵپشت.
(٤) بورغو و پێچو مۆرەی سەر دەرپۆقیوی مەکینە.

*v.t.* (١) بە قرتێنکە یا دوگمە ڕازاندنەوە.
(٢) بە سەردا بڵاوبوونەوە بە پەری: *( Rocks ~ the hillside.)*
(٣) پێدا بڵاوکردنەوە بە تێروتەسەلی.
(٤) دیوار دروستکردن بە دیرەك یا داری ڕاوەستاو؛ دیرەك دانەبەر.

**stud** (stud), *n.* (١) ڕەوکە ئەسپی پەڕاندن
(٢) جێی بەخێوکردن یا ڕاگرتنی ئەم ئەسپانە. (٣) ئەسپی پەڕاندن.

**studbook** (stud′book′), *n.* تۆمارنامە یا کتێبی بنەچەی ئەسپ (بەتایبەتی هی ئەسپی غارغارێن).

**studding** (stud′in), *n.* (١) (ا) چوارچێوەی دارینی خانوو.
(ب) سەرجەمی دیرەك یا داری چوارچێوەی دیوار.
(٢) قرتێنەو دوگمەی ڕوویەك.

**studding-sail** (stud′iŋ-sāl′), *n.* بایەوانێکی تەنکە لە دەرەوەی بایەوانی سەرەکیدا.

**student** (stōō′d'nt, stū′d'nt), *n.* (١) قوتابی؛ شاگرد؛ خوێندکار.
(٢) لێکۆڵەرەوە: *( a ~ of human behavior, history, etc.)*

**student body,** هەموو قوتابیانی قوتابخانەیەك یا زانکۆیەك.

**student government,** ڕێکخراوی قوتابیانی قوتابخانە یا زانکۆ؛ یەکێتی قوتابیان.

**studentship** (stōō′d'nt-ship′, stū′d'nt-ship′), *n.* (١)- قوتابییەتی. (٢) [British]، بەخششی قوتابی (بۆ خوێندن).

**student teacher,** قوتابی مامۆستا؛ قوتابییەکی دوا ساڵی زانکۆیە وانە دەڵێتەوە لەژێر سەرپەرشتی مامۆستایەکدا.

**studhorse** (stud′hôrs′), *n.* ئەسپی پەڕین

**studied** (stud′id), *adj.* (١) باش لێکۆڵراوە؛ بە ووردی لێکۆڵراوە.
(٢) دەسەنقەست: *( ~ indifference )*.
(٣) [Rare]، زانا؛ بزان؛ دانا.

**studio** (stōō′di-ō′, stū′di-ō′), *n.* ستۆدیۆ: (ا) کارخانەی هونەرمەند؛ جێی کاری نیگارکێش‌و وێنەگرو پەیکەرتاش... هتد؛ وێنەگا؛ وێنەخانە.
(ب) جێی فێربوون یا فێرکردنی هونەرێك؛ هونەرخانە: *( a dance ~ )*.
(ج) فیلم خانە؛ جێی فیلم گرتن‌و ئامادەکردن.
(د) ژووری لێوە بڵاوکردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆن.

(ﻫ) **studio apartment**.

**studio apartment,** ستۆدیۆی ژیان: ژوورێکە هەموو پێویستییەکی وەك چێشتخانەو ئاودەستی تێدایە بۆ تیا ژیان

**studio couch,** قەنەفەیەکە دەکرێتەوە بۆ لەسەر نوستن.

**studious** (stōō′di-əs, stū′di-əs), *adj.* (١) کۆششکەر؛ سەعیکەر: *( a ~ student )*

(٢) زۆر نیشکەر؛ هەوڵدەر. (٣) بەتەنگەوەهاتوو.

(٤) [Rare]، دەستقەست.

(٥) هانی کۆشش کردن یا سەعی کردن دەدات (دەوروبەر).

**studwork** (stud′wûrk′), *n.* (١) شتی بە قرتێنەو دوگمە ڕازاوە.

(٢) چوارچێوەی دارینی خانوو (بەتایبەتی دیرەکەکانی ناو دیوارەکان).

**study** (stud′i), *n.* (١) خوێندنەوە؛ کۆشش کردن؛ کۆشش؛ سەعی.

(٢) لێکۆڵینەوە: بە ووردی تێڕوانین:

*( After ~ of the matter the judge gave his decision.)*

(٣) لقێکی زانست؛ ڕشتە.

(٤) (*pl.*) - خوێندن: *( He is doing well in his studies .)*.

(٥) (ا) ووتاری نووسراوە؛ باس. (ب) گەڵاڵەی چیرۆك، وێنە... هتد.

(ج) پارچەیەك مۆسیقای کورت (بۆ مەشق).

(٦) مەبەست؛ نیاز؛ ویستن:

*( Her constant ~ is to do a job well.)*

(٧) بیرکردنەوە

(٨) ژووری خوێندنەوەو نووسین... هتد لە ماڵێکدا:

*( He spends a lot of time in his ~ .)*

(٩) شاگرد (شانۆگەری- بەتایبەتی لەڕووی بەتوانایی ئەو کەسەوە):

*( He is a quick ~ .)*

*v.t.* (١) خوێندن: *( She ~ies history.)*.

(٢) (ا) لێکۆڵینەوە *( I shall ~ your problem.)*.

(ب) تێڕوانین؛ لێ ووردبوونەوە: *( He ~ies the map.)*.

(٣) خوێندنەوە؛ کۆشش کردن؛ سەعی کردن. (٤) لەبەرکردن.

(٥) ویستن؛ مەبەست بوون.

*v.i.* (١) خوێندنەوە: کۆشش کردن؛ سەعی کردن.

(٢) خوێندن؛ چوونە قوتابخانە. (٣) بیرکردنەوە.

**study hall,** (١) ژووری خوێندنەوە (لە قوتابخانەدا).

(٢) ساتی تەرخانکراو بۆ خوێندنەوە یا سەعی کردن ( لە قوتابخانەدا).

**stuff** (stuf), *n.* (١) کەرەسەی خاو (کە شتی لێ درووست دەکرێ ).

(٢) ناوکرۆك؛ کرۆك. (٣) (ا) ماددە؛ شت. (ب) هێز.

(٤) کالا (بەتایبەتی هی خوری)؛ قوماش.

(٥) (ا) شتومەکی ناومال. (ب) کەلوپەلی کەسی. (ج) شت؛ شتومەك؛ کەل‌وپەل.

(٦) شتی خواردنەوە یا قووتدان (بەتایبەتی دەرمان ).

(٧) شتی فڕێدراو؛ شتی بێ نرخ یا هیچ‌وپووچ.

(٨) قسەی هیچ‌وپووچ؛ قسەی قۆڕ.

*v.t.* (١) (ا) پڕکردن (ب) ئاخنین (دۆشەك، قەنەفە، لێفە).

(ج) مۆمیاکردن (باڵندە، گیاندار).

(د) پڕکردنی قەل‌و مریشك لە برنج‌و بەهارات... هتد پێش لێنانی بە فڕن:

*( to ~ a turkey)*

(٢) (ا) ئاخنین؛ سیخناخ کردن؛ تێ ترنجاندن؛ تێ پەستن.

(ب) زۆر خواردن؛ وورگ ئاخنین.

(٣) پڕکردن؛ ئاخنین: *( He ~ed his head with facts.)*.

(٤) پڕکردنی سنووقی دەنگدان بە کاغەزی دەنگدانی ساختە.

(٥) (ا) بەربەستکردن؛ داخستن (کون). (ب) قوڕگ‌و لووت گیران (هەڵامەت).

(٦) تێخستن؛ خستنەناو.

*v.i.* زۆر خواردن؛ بە پەلە خواردن.

**stuffed shirt,** [Slang], کەسێکی لەخۆبایی‌و بەفیزی هیچ‌وپووچ.

**stuffing** (stuf′iŋ), *n.* (١) ئاخنین؛ زۆر تێکردن؛ زۆر خواردن؛ زۆر پڕکردن. (٢) (ا) ناواخنی دۆشەك‌و قەنەفەو لێفە.

(ب) ناواخنێکە دەکرێتە ناو قەل‌و مریشکەوە پێش خستنەناو فڕنەوە (کە بریتی‌یە لە برنج‌و کاکڵە گوێزو بەهارات).

**stuffy** (stuf′i), *adj.* (١) هەوا پیس: *( a ~ room )*.

(٢) گیراو (لووت بەهۆی هەڵامەتەوە): *( a ~ nose )*.

(٣) [Colloq.]، (ا) ووشك (مەجان)؛ ناخۆش: *( a ~ dinner party )*.

(ب) ووشك (مرۆڤ).

(٤) [Colloq.]، بیرتەسك؛ کۆنەپەرست.

(٥) [Colloq.]، توندوتیژ (ڕەووشت)؛ خۆ بە ڕاست زان.

(٦) [Colloq.]، مۆن؛ گرژ؛ مڕومۆن.

-stuffily *(adv.)*; **stuffiness** *(n.)*.

**stull** (stul), *n.* کۆلەکەی کانگە

**stultify** (stul′tə-fī′), *v.t.* (١) بە گەوج، بێ مێشك، یا هیچ نەزان پیشاندان؛ گەوجی یا بێ مێشکی دەرخستن؛ گاڵتەپێکردن.

(٢) پووچکردنەوە؛ بێ کەڵك کردن؛ بێ نرخ کردن.

(٣) بەڵگەهێنانەوە بۆ شێتێتی یا مێشك ناتەواوی (دادگا).

-stultification *(n.)*; **stultifier** *(n.)*.

**stum** (stum), *n.* (١) خۆشاوی نەترشاو یا نیمچە ترشاوی ترێ.

(٢) شەرابێکە کە ئەم خۆشاوەی تێ کرابێ.

*v.t.* خۆشاوی نەترشاوی ترێ کردنە شەرابەوە.

**stumble** (stum′b'l), *v.i.* (١) پێ هەڵکەوتن؛ چورتمدان؛ ساتمەکردن؛ سەرسمدان؛ نووچدان. (٢) لەتربردن (لە پیری یا لاوازیدا)؛ بە لارەولار ڕۆیشتن.

(٣) زمان هاتن بەیەکدا؛ بە سەر لێ شێواوی‌و نەزانانە کردن:

*( He ~d through his recitation.)*

(٤) هەڵەکردن؛ تاوان کردن؛ خراپەکردن.

(٥) بە ڕێکەوت دۆزینەوە؛ بە ڕێکەوت دەسکەوتن:

*( I ~d on an answer.)*

*v.t.* چورتم پێدان؛ نووچ پێدان؛ ساتمە پێدان.

*n.* (١) ساتمە؛ چورتم؛ سەرسمدان؛ پێ هەڵکەوتن؛ نووچ.

(٢) هەڵە؛ تاوان؛ کاری خراپە.

**stumblebum** (stum′b'l-bum′), *n.* [Slang], (١) بۆکسبازێکی لێ نەهاتوو. (٢) کەسێکی لێ نەهاتوو ناکارامە.

**stumbling block,** کۆسپ؛ قۆرت؛ تەگەرە.

**stump** (stump), *n.* (١) بنکەدار؛ بنك؛ پاشماوەی قەدی درەخت دوای بڕینەوە؛ کۆتکەدار؛ بنج.

(٢) پاشماوەی ئەندامێکی بڕاوە (لاق، باڵ)؛ بنێخ (دان)؛ کۆتەرە.

(٣) قنچك؛ قنك (جگەرە، قەڵەم)؛ پنك: *( the ~ of a pencil )*.

(٤) کەسێك یا گیاندارێکی قەڵەوو کورتەباڵا؛ کەسێکی خڕپنە.

(٥) دووانگە؛ جێی ووتاربێژانی ڕامیاری: *( to go on the ~ )*.

(٦) تەپەی پێ.

(٧) لوولەیەك کاغەز یا لاستیکە لە وێنەیەکی بە قەڵەم یا بۆیە کراو دەخرێ بۆ ڕێك‌وپێك کردنی. (٨) بەرەنگاری.

(٩) (*pl.*) [Colloq.]، لاق؛ لاقەکان. (١٠) لاقی دەستکرد.

*v.t.* (١) بڕینەوە (درەخت، لاق، باڵ)؛ وەك کۆتەرە لێکردن؛ قرتاندن‌و بنێخ بەجێهێشتن. (٢) بنکەدارو بنجە گیاو دەوەن لە ڕەگ هەڵکێشان؛ زەوی پاکردنەوە لە کۆتەرە. (٣) گەڕان بە ناوچەیەکداو ووتاردان.

(٤) [Colloq.]، لە تۆخی‌و زەقی وێنەی کێشراو کەمکردنەوە.

(٥) [Colloq.]، پەنجەی پێ لێ هەڵکەوتن؛ پێ لێ هەڵکەوتن.

(٦) [Colloq.]، واق وڕماندن؛ سەرسوڕماندن.

(٧) [Colloq.]، بەرەنگاربوون؛ ڕووبەڕوو وەستان.

*v.i.* (١) بە تەپەتەپ‌و ناڕێك‌وپێکی ڕۆیشتن بەڕێوە.

(٢) گەڕان‌و ووتاری ڕامیاری دان.

**on the stump,** [Colloq.], گەڕان‌و ووتاری ڕامیاری دان.

**up a stump,** [Colloq.], پەشۆکاو؛ شڵەژاو؛ واق وڕماو؛ سەر لێ شێواو.

**stumpage** (stump′ij), *n.* (١) داری بە پێوە پێش بڕینەوەی.

(٢) نرخی ئەم دارە. (٣) مافی برینەوەی ئەم دارە (بۆ خانووکردن).
**stumpy** (stum′pi), *adj.* (١) پڕە لە کۆتەرە
(٢) کورتەبنە؛ کورت و ئەستوور.
-stumpiness *(n.).*
**stun** (stun), *v.t.* (١) گێژکردن، بە لێدان؛ وڕکردن؛ تاس پێ بردنەوە؛
لە هۆش خۆ بردن. (٢) کەڕکردن (بۆ سەردەمێکی کورت)؛ کاس کردن.
(٣) حەپەساندن؛ واق وڕماندن؛ زۆر سەرسوڕماندن؛ وڕکردن:
*( He ~ed his nation with his resignation.)*
*n.* (١) وڕی؛ کاسی؛ حەپەسان؛ واق وڕمان.
(٢) ڕووداوێك یا لێدانێکی وڕکەر.
**stung** (stuŋ), *past tense and p.p. of* **sting.**
**stunk** (stuŋk), *p.p. and alternative past tense of* **stink.**
**stunner** (stun′ēr), *n.* (١) وڕکەر؛ کاسکەر؛ کەڕکەر؛ حەپەسێنەر.
(٢) [Colloq.]. کەسێکی زۆر جوان و شۆخ و شەنگ؛ کەسێکی دڵفڕێن.
**stunning** (stun′iŋ), *adj.* (١) وڕکەر؛ کاسکەر؛ کەڕکەر؛ حەپەسێنەر.
(٢) [Colloq.]. زۆر جوان و شۆخ و شەنگ؛ دڵفڕێن.
-stunningly *(adv.).*
**stunsail, stuns'le** (stun′s'l), *n.* = **studdingsail.**
**stunt** (stunt), *v.t.* ڕێی پەرەسەندن یا گەشەکردن لێ گرتن؛
ڕێ نەدان بە گەورەبوون یا گەشەکردنی ئاسایی.
*n.* (١) ڕێی پەرەسەندن یا گەشەکردن لێ گرتن.
(٢) ڕێگر لە گەشەکردن یا گەورەبوون.
(٣) نەخۆشییەکی ڕووەکە دەبێتەهۆی گەشەنەکردن؛ کورتەبنە.
(٤) نەخۆشییەکە ڕێی گەورەبوون یا گەشەکردنی ڕووەك دەگرێ.
**stunt** (stunt), *n.* [Colloq.]. کارێکی سەرنجڕاکێش و
خۆدەرخستن کراو؛ کارێکی چاونەترسانە و لێهاتووانە.
*v.i.* کارێکی نازایانە کردن بۆ سەرنج ڕاکێشان و خۆدەرخستن.
**stunt man,** کەسێکە بەکاری ترسناکی فیلمێك (وەك بازدان و کەوتن)
هەڵدەستێت لەباتی ئەستێرە سینەماییەکە خۆی.
**stupa** (stōō′pə), *n.* پەرستگایەکی بوودایییە لە شێوەی گومەزدا.
**stupe** (stōōp, stūp), *n.* پەڕۆیەکی تەڕو گەرمی هەندێ جار دەرمان
لێدراوە دەخرێتەسەر ئەندامێکی لەش بۆ ئازار کەمکردنەوە.
**stupefacient** (stū´pə-fā′shənt), *adj.* سڕکەر
*n.* دەرمانی سڕکەر.
**stupefaction** (stōō´pə-fak′shən, stū′pə-fak′shən), *n.* (١)
وڕی؛ گێژی؛ سڕی؛ وڕکردن؛ وڕبوون؛ کاس بوون؛ حەپەسان.
(٢) واق وڕمان؛ زۆر سەرسوڕمان.
**stupefy** (stōō′pə-fī´, stū′pə-fī´), *v.t.* (١) وڕکردن؛ کاس
کردن؛
سڕکردن. (٢) واق وڕماندن؛ زۆر سەرسوڕماندن.
-stupefier *(n.).*
**stupendous** (stōō-pen′dəs, stū-pen′dəs), *adj.* (١) زۆر سەیر؛
سەرسوڕهێنەر؛ واق وڕهێنەر؛ زۆر سەرنج ڕاکێش.
(٢) زۆر گەورە؛ زۆر زل؛ مەزن؛ بێ شومار.
**stupid** (stōō′pid, stū′pid), *adj.* (١) وڕ؛ کاس؛ گێژ.
(٢) کەر؛ گەوج؛ کەودەن؛ بێ مێشك؛ جلفر؛ دەبەنگ؛ گەلۆر.
(٣) بێ مانا؛ نابەجێ؛ بێ مێشکانە؛ هیچ وپووچ *( a ~ idea)*.
(٤) وڕشت؛ ناخۆش *( a ~ job, story, party, etc.)*.
*n.* کەسێکی کەر، بێ مێشك، گەوج، یا کەودەن.
-stupidly *(adv.)*; stupidness *(n.).*
**stupidity** (stōō-pid′ə-ti, stū-pid′ə-ti), *n.* (١) کەرێتی؛ گەوجی؛
کەودەنی؛ بێ مێشکی؛ دەبەنگی؛ جلفری. (٢) کارێك، وتەیەك، یا بیرێکی
کەرانە؛ شتێکی بێ مێشکانە؛ کردەوەیەکی گەوجانە.
**stupor** (stōō′pēr, stū′pēr), *n.* (١) وڕی؛ کاسی؛ گێژی.
(٢) بێ هۆشی؛ بێ ئاگایی؛ سڕی.
-stuporous *(adj.).*
**sturdy** (stûr′di), *adj.* (١) بەهێز؛ بەتین؛ چوست و چالاك؛ تۆکمە.
(٢) (ا) بەرگەگر (هێرش)؛ قایم؛ توند؛ بەهێز: *( a ~ defense )*.
(ب) چەسپیو؛ نەگۆڕ: *( a ~ policy )*.
-sturdily *(adv.)*; sturdiness *(n.).*
**sturdy** (stûr′di), *n.* سەرەخولێ یا سەر گێژخواردنی مەڕ.
**sturgeon** (stûr′jən), *n.* جۆرە ماسییەکی گەورەیە کەراکەی دەخورێت
وە ڕێی دەووترێ کاڤیار.
**stutter** (stut′ēr), *v.t. & v.i.* زمان گرتن؛ زمان گیران.
*n.* زمان گیری؛ لاڵی؛ لاڵەپەتەیی.
-stutterer *(n.)*; stutteringly *(adv.).*
**sty** (stī), *n.* (١) تەویلەی بەراز؛ گەوڕی بەراز.
(٢) شوێنێکی زۆر پیس وپۆخڵ.
*v.t. v.i.* لە شوێنێکی زۆر پیس وپۆخڵدا حەوانەوە.
**sty, stye** (stī), *n.* سیچکە سلاوە؛ قنچکە سلاو؛ قنچکە سلاوە.
**Stygian** (stij′i-ən), *adj. Also* **stygius,** (١) (ا) تاریك و نووتەك؛
ناخۆش؛ دڵپەستکەر. (ب) دۆزەخی. (٢) نابێ بشکێنرێ (پەیمان، سوێند).
**stylar** (stī′lēr), *adj.* (١) دەرزی ئاسا (ووشەی داهاتوو ببینە).
(٢) تایبەتی بە ئەندامی باریکی نێرك.
**style** (stīl), *n.* (١) ئامێرێکی نووك تیژە پێشینان شتیان پێ دەنووسی
لەسەر تەبەقی مێو. (٢) (ا) [Obs.]، پێنووس، قەڵەم.
(ب) دەرزی قەوان لێدان. (ج) ئامێری هەڵکەندن یا هەڵکۆڵینی شت لەسەر
دار و تەختە و کانزا. (د) دەرزی یا میل (کاتژمێر... هتد).
(هـ) ئەندامی باریکی نێرك، واتە، مێ ئەندامی گوڵ (ڕووەکناسی).
(٣) (ا) شێوەی نووسین یا داڕشتن؛ شێواز.
(ب) شێواز (هونەر)؛ شێوەی هێنانەدی بەرهەمێکی هونەری:
*( the Renaissance ~ ; the modern ~ )*
(٤) شێواز جوانی و چاکی؛ نایابی شێواز: *( This auother lacks ~ .)*
(٥) شێواز؛ شێوەی کردنی هەر کارێك.
(٦) مۆدە؛ باوی تازە؛ تازە بابەت.
(٧) شۆخ وشەنگی؛ ڕێك وپێکی و جوانی؛ جوان پۆشی و ڕەفتاری.
(٨) نازناو: *( He is entitled to the ~ of "Mayor." )*.
(٩) جۆر؛ چەشن. (١٠) شێواز (چاپەمەنی).
*v.t.* (١) پێ ووتن؛ وەها ناونان یا ناوبردن:
*( Abraham Lincoln was ~d the Great Emancipator.)*
(٢) شێواز دانان.
(٣) شێواز گونجاندن (چاپەمەنی).
**stylebook** (stīl′book´), *n.* ڕابەری شێواز (چاپەمەنی).
**stylet** (stī′lit), *n.* (١) خەنجەری بچووك (هەروەها " stiletto ").
(٢) ئامێرێکی پزیشکی باریك و کولە بۆ تێڕوانینی برین.
(٣) ئەندامی چوقوڵ یا درك ئاسایی (گیانەوەرناسی).
**styliform** (stīl′i-fôrm´), *adj.* باریك ودرێژ (گیانەوەرناسی)؛
چوقوڵ ئاسایی؛ نووك تیژ.
**stylish** (stīl′ish), *adj.* شۆخ؛ تازە بابەت؛ تەڕپۆش؛ نوێ باو؛
بە ڕێی دوا مۆدە: *( a very ~ gown, dress, suit, etc.)*.
**stylist** (stīl′ist), *n.* (١) شێوازناس (نووسین)؛ شێوازدار؛ شێوازدانەر؛
شێوازداڕشتی لێهاتوو؛ نووسەرێکە کە زۆر بایەخ بە شێواز بدات و خاوەنی
شێوازی خۆیشییەتی.
(٢) شێواز دانەری جل وبەرگ؛ نەخشەکاری جل وبەرگ... هتد.
**stylistic** (stī-lis′tik), *adj.* شێوازی؛ تایبەتی بە شێواز.
-stylistically *(adv.).*
**stylistics** (stī-lis′tiks), *n.pl.* شێوازناسی.
**stylite** (stī′līt), *n.* ووشکە سۆفییەکی خاچ پەرستی سەدانی ناوەڕاستە
کە لەسەر تەوقەسەری کۆڵەکە یا پایە دەژیا.
**stylize** (stīl′īz), *v.t.* لەسەر شێوازێکی تایبەتی دانان؛

لەگەڵ شێوازێکی تایبەتیدا گونجاندن.

**-stylization** *(n.).*

**stylo-** (stī′lō, stī′lə), *Also* **styl-**, پێشگرێکە بەمانای: تیژ؛ نووک تیژ؛ نووکدار: ***( stylograph )*** .

**stylobate** (stī′lə-bāt´), ***n.*** بنك یا بناغەی ڕیزە پایە. (خانوسازی یۆنان و ڕۆمان).

**stylograph** (stī′lə-graf´, stī′lə-gräf´), ***n.*** پاندان؛ قەڵەم پاندان

**stylography** (stī-log′rə-fi), ***n.*** نووسین، هەڵکۆڵین، یا نەخشە کردن بە ئامێرێکی نووک تیژ.

**-stylographic; stylographical** *(adj.).*

**styloid** (stī′loid), ***adj.*** باریك و نووك تیژ (بەتایبەتی ئێسقان) (توێکاری)؛ دەرزی ئاسایی.

**stylotite** (stī′lə-līt´), ***n.*** پایەیەکی بچکۆلەی درزاوی بەردە قسڵ (زەمینناسی).

**stylus** (stī′ləs), ***n.*** (١) ئامێری باریك و نووك تیژ (نووسین، هەڵکۆڵین). (٢) (ا) ئامێری درزکردنە قەوانەوە. (ب) دەرزی قەوان لێدان.

**stymie** (stī′mi), ***n.*** ***Also*** **stimy,** (١) ڕاوەستانی تۆپی یاریکەرێك لە بەینی تۆپی یاریکەرێکی تر و کونی گۆڵەکەدا (گۆڵف). (٢) تۆپێکی وەها وەستاو. (٣) کۆسپ؛ قۆرت. (٤) بارێکی تەنگوچەڵەمەیی؛ بارێکی شلۆق یا ناهەموار.

***v.t.*** (١) ڕێ لە تۆپی یاریکەری تر گرتن (گۆڵف). (٢) ڕێ لێگرتن؛ کۆسپ خستنە بەردەم.

**stymy** (stī′mi), ***n. & v.t.*** = **stymie.**

**stypsis** (stip′sis), ***n.*** خوێن وەستانەوە

**styptic** (stip′tik), ***adj.*** ***Also*** **styptical,** (١) خوێن وەستێنەرەوە بە هێنانەوەیەکی دەماری خوێن. (٢) خوێن وەستێن.

**styrax** (stir′aks), ***n.*** = **storax.**

**styrene** (stī′rēn, stêr′ēn), ***n.*** ستایرین: شلەیەکی بێ ڕەنگ یا زەردباوی بۆن خۆشە لاستیك و پلاستیکی لێ دروست دەکرێ.

**styrofoam** (stī′rə-fōm´), ***n.*** ستایرۆفۆم: جۆرێکە لە پلاستیکی قایم.

**Styx** (stiks), ***n.*** ستیکس: ڕووبارێکی دۆزەخە (ئەفسانەی یۆنانی).

**suable** (sōō′ə-b'l, sū′ə-b'l), ***adj.*** بۆی هەیە بدرێ بە دادگا؛ دەشێت بۆ دادخوازی.

**-suability** *(n.).*

**suasion** (swā′zhən), ***n.*** سەلماندن؛ پێ سەلماندن.

**suave** (swāv), ***adj.*** ناسك (ڕەوشت)؛ زمان شیرین؛ ڕەوشت جوان؛ زمان لووس: بە نەزاکەت.

**-suavely** *(adv.)*; **suaveness; suavity** *(n.).*

**sub** (sub), ***n.*** [Colloq.], (١) **submarine** . (٢) **subordinate** . (٣) **substitute** .

***v.i.*** کارکردن لە بریتی کەسێك؛ جێگرتن؛ بریکاری کردن.

**sub** (sub), ***n.*** [Colloq.], ساندویچ؛ جۆرێکە لە ساندویچ.

**sub-** (sub, səb), پێشگرێکە بەمانای: (١) لەژێر؛ لەبن؛ خواروو. (٢) لە خوار (پلە)؛ نزمتر: ***( subprincipal )*** . (٣) کەمتر لە؛ نیمچە: ***( subhuman, subtropical )*** . (٤) لق؛ بەش؛ کەرت؛ ناسەرەکی: ***( subdivision )*** .

**subacid** (sub-as′id), ***adj.*** (١) نەختێك مزر؛ نەختێك ترش (میوە). (٢) نەختێك توندوتیژ یا بڕ (ووتە).

**subacute** (sub´ə-kūt′), ***adj.*** (١) نیمچە تیژ (گۆشە). (٢) نیمچە توندوتیژ (نەخۆشی).

**subaerial** (sub´âr′i-əl, sub´ā-ēr′i-əl), ***adj.*** ژێرهەوایی: کەوتووەتە سەر ڕووی زەمین یا نزیکی ڕووی زەمین؛ لە ڕووی زەمیندا ڕوودەدات.

**subagent** (sub-ā′jənt), ***n.*** نوێنەری نوێنەر؛ بریکاری بریکار.

**subalpine** (sub-al′pīn, sub-al′pin), ***adj.*** (١) تایبەتی بە دامێنی شاخی "ئالپ". (٢) (ا) هی دامێنی شاخ. (ب) لە دامێن یا قەدی شاخدا دەڕوێت.

**subaltern** (səb-ôl′tērn), ***adj.*** (١) ژێردەست؛ نزمتر؛ لەژێر (پلەوپایە) (٢) [British]، لە خوار ئەفسەری سێ ئەستێرەوە. (٣) تایبەتی (ژێربێژی)؛ ناسەرەکی.

***n.*** (١) کەسێکی ژێردەست. (٢) ئەفسەری خوار کاپتن. (٣) بیرێکی ناسەرەکی یا پاشکۆ.

**subantarctic** (sub´ant-ärk′tik), ***adj.*** تایبەتی بە ناوچەی نزیك تەوەری باشوورەوە.

**subaqueous** (sub-ā′kwi-əs, sub-ak′wi-əs), ***adj.*** (١) بۆ ژێر ئاو کراوە یا دەشێت ژێرئاوی. (٢) لەژێر ئاودا دەژی؛ لەژێر ئاودا پێکدێت یا ڕوودەدات.

**subarctic** (sub-ärk′tik), ***adj.*** تایبەتی بە ناوچەی دەورووپشتی تەوەری باکووری.

**subarid** (sub-ar′id), ***adj.*** نەختێك ووشکانی.

**subatomic** (sub-at′əm), ***adj.*** کەرتە گەردیلەیی؛ کەرتە ئەتۆمی.

**subaudition** (sub´ô-dish′ən), ***n.*** (١) تێگەیشتنی ووتە یا بیری نەووتراو یا دەرنەبڕاو (بە لێکدانەوە). (٢) ووتە یا بیری وەها.

**subaverage** (sub′av´ēr-ij), ***adj.*** لە خوار مام ناوەندییەوە؛ لە مام ناوەندی کەمتر: ***( ~ minds; a ~ education )*** .

**subbase** (sub′bās´), ***n.*** بنی بنك (خانووسازی).

**subbasement** (sub′bās´mənt), ***n.*** نهۆم یا ژووری ژێر ژێرخان.

**subbranch** (sub′branch´), ***n.*** لقی لق.

**subcaliber** (sub-kal′ə-bēr), ***adj.*** (١) پێوانە بچووکتر (گوللەیەك کە بچووکتر بێ لە لوولەی ئەو تفەنگەی پێی تەقێنراوە). (٢) تایبەتی بەم جۆرە گوللەیە.

**subcelestial** (sub′sə-les´chəl), ***adj.*** (١) ژێرئاسمانی؛ زەمینی. (٢) ئاسایی؛ سادە

**subcellar** (sub′sel´ēr), ***n.*** ژێرزەمینی ژێرزەمین.

**subchaser,** = **submarine chaser.**

**subclass** (sub′klas´, sub′kläs´), ***n.*** کەرتە چین؛ لقە چین.

**subclinical** (sub-klin′i-k'l), ***adj.*** نیشانەکانی دیار نییە بۆ پشکنینی پزیشکی (نەخۆشی): ***( a ~ infection )***

**subcommittee** (sub′kə-mit´i), ***n.*** لیژنەی لقی؛ لیژنەی ناسەرەکی.

**subconscious** (sub-kon′shəs), ***adj.*** (١) هەست پێ نەکراو؛ کەم هەستپێکراو؛ پێ نەزانراو (هەست): ***( her ~ motives )*** (٢) لە مێشکدایە بەبێ ئاگای کەسەکە خۆی؛ شاراوە؛ هۆشی ناخ یا ناوەوە یا شاراوە: ***( the ~ self )***

***n.*** هەست و نەستی شاراوە؛ هەست و بیری شاراوە؛ هۆش و هەستی ناخ یا ناوەوە.

**-subconsciously** *(adv.)*; **subconsciousness** *(n.).*

**subcontinent** (sub-kon′tə-nənt), ***n.*** نیمچە کیشوەر.

**subcontract** (sub-kon′trakt), ***n.*** کەرتە قۆنتەرات؛ بەڵێننامەی ناسەرەکی یا لقی.

***v.t. & v.i.*** قۆنتەرات دان بە قۆنتەراتچی بچووکتر لە خۆ (لەلایەن قۆنتەراتچی گەورە یا سەرەکییەوە)؛ قۆنتەرات وەرگرتن لە قۆنتەراتچی گەورەتر لە خۆ (لەلایەن قۆنتەراتچی بچووکەوە).

**subcontractor** (sub′kon´trak-tēr), ***n.*** قۆنتەراتچی بچووك (کە قۆنتەرات لە قۆنتەراتچی گەورە وەردەگرێ)؛ بەڵێنداری ناسەرەکی (خانووکاری... هتد).

**subcutaneous** (sub´kū-tā′ni-əs), ***adj.*** ژێرپێستی؛ لەژێر پێستدایە.

**sub-department** (sub′di-pärt´mənt), ***n.*** لقی لق؛ نیمچە بەش؛ لقی ناسەرەکی؛ بەشی ناسەرەکی.

**subdividable,** بەش بەش دەکرێت؛ دەشێت بکرێ بە بەشی بچووکترەوە.

**subdivide** (sub′də-vīd´), ***v.t.*** (١) بەش کردن بە بەشی بچووکترەوە؛ دیسانەوە بەش بەش کردنی شتێکی لەوەوپێش بەش کراو.

(۲) بەش کردنی زەوی بە پارچەی بچووکترەوە بۆ فرۆشتنی بە ئاسانی.
**subdivision** (sub′də-vizh´ən), *n.* (۱) بەش کردن بە بەشی بچووکترەوە؛ سەرلەنوێ بەش بەش کردن. (۲) پارچە (زەوی بەش کراو)؛ کەرت؛ بەش؛ لق
**subdominant** (sub-dom′ə-nənt), *adj.* نیمچە زاڵ (ئاوازی مۆسیقا).
**subdue** (səb-dōō′, səb-dū′), *v.t.* (۱) (ا) داگیرکردن؛ خستنەژێر دەست یا ڕکێفەوە؛ بەزاندن. (ب) زاڵبوون بەسەردا؛ دابینکردن؛ لە بەرگری خستن: ( *They caught the criminal and ~d him.* ).
(۲) دابینکردن؛ دامرکاندنەوە؛ کوژاندنەوە. ( *to ~ her foolish fears* ).
(۳) کشتوکاڵ تێداکردن؛ کشتکردن: ( *to ~ the land* ).
(٤) کەمکردنەوە (دەنگ، ڕەنگ، ڕووناکی)؛ کزکردن:
*( a ~d light; to ~ unwanted sound )*
-subdual *(n.)*; subduable *(adj.)*; subduer *(n.)*.
**subeditor** (sub-ed′i-tẽr), *n.* یاریدەدەری سەرنووسەر؛ خواردەستی سەرنووسەر.
**suberin** (sōō′bẽr-in, sū′bẽr-in), *n.* ماددەیەکی چەورە لە توێکڵی درەختی تەپەدۆردا هەیە.
**suberize** (sōō′bə-rīz´, sū′bə-rīz´), *v.t.* وەك تەپەدۆر لێکردن (ڕووەکناسی).
-suberization *(n.)*.
**suberose** (sōō′bə-rōs´, sū′bə-rōs´), *adj. Also* **suberous,** تەپەدۆری.
**subfamily** (sub′fam´ə-li, sub-fam′ə-li), *n.* تیرە (پۆل پۆل کردنی گیاندارو ڕووەك).
**subgenus** (sub-jē′nəs), *n.* ڕەگەز (پۆل پۆل کردنی گیاندارو ڕووەك).
**subglacial** (sub-glā′shəl), *adj.* لەژێر ڕوباری سەهۆڵدایە.
**subgroup** (sub′grōōp´), *n.* کەرتە کۆمەڵ؛ لقە تیرە.
**subhead** (sub′hed´), *n.* (۱) سەرووتاری ئاسەرەکی: سەرووتاری بچووك. (۲) یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانە.
**subheading** (sub-hed′iŋ), *n.* = **subhead # 1.**
**subhuman** (sub-hū′mən), *adj.* (۱) بۆ مرۆڤ ناشێت:
*( ~ conditions of life; ~ treatment )*
(۲) لە مرۆڤ کەمتر (لە پلەی پێشکەوتندا)؛ لە مرۆڤ خوارتر:
*( the ~ primates )*
**subinfeudation** (sub´in-fyoo-dā′shən), *n.* (۱) سەرلەنوێ بەکرێدانی زەوییەکی بە کرێ گیراو لە دەرەبەگ لەلایەن کرێگرتەی یەکەمەوە.
(۲) خاوەنێتی وەها. (۳) زەوییەکی وەها بەکرێدراو.
**subirrigate** (sub-ir′ə-gāt´), *v.t.* ئاودانی زەویوزار لە ژێرزەمینەوە (بەهۆی بۆری کون کوناوی بە ژێرزەمیندا ڕاکێشراو).
**subjacent** (sub-jā′s′nt), *adj.* (۱) ژێرەوە؛ هی ژێرەوە
(۲) خوارتر بەڵام نەك یەکسەر لە ژێریدا.
**subject** (sub′jikt), *adj.* (۱) ژێردەستە؛ بەندە: ( *~ peoples* ).
(۲) ( to ~ ) : بۆی هەیە؛ لەوانەیە: ( *He is ~ to fits of anger.* ).
(۳) ( to ~ ) : مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ؛ دەشێت وەهای لێ بێت:
*( He is ~ to censure. )*
(٤) ( to ~ ) . دەکەوێتە سەر؛ بەستراوە بە؛ بەو مەرجەیە:
*( The plan is ~ to his approval.)*
*n.* (۱) لاشەی یەکالاکراوە بۆ لێکۆڵینەوە.
(۲) باس (گفتوگۆ، نووسین، لێکۆڵینەوە).
(۳) ڕشتە؛ بابەتی خوێندن: ( *Mathematics is his favorite ~ .* ).
(٤) هۆ ( *a ~ for great sorrow.* ).
(٥) بکەر (ڕێزمان) (ووشەی " he " " they " و " the book " لەم ڕستانەدا)
*( He is here. They did not come. The book is on the table.)*

(٦) پێشنیازی بەڵگە بۆ هێنراوە (بۆ سەلماندن یا پووچکردنەوە) (ژیرێژی).
(۷) (ا) کرۆك؛ ماك. (ب) مێشك و گیان و منایەتی (فەلسەفە).
*v.t.* (۱) خستنەژێر. (۲) خستنە بەردەم؛ پێشکەش کردن.
(۳) خستنەژێر دەستەوە؛ هێنانە ژێر ڕکێفەوە؛ مل پێ کەچ کردن.
(٤) ( to ~ ) واڵێکردن؛ دانەبەر؛ خستنە مەترسییەوە:
*( His weakness ~ed him to many diseases.)*
(٥) ( to ~ ) پێ چەشتن؛ پێ کردن؛ بەسەرداهێنان:
*( to ~ someone to insult, ridicule, criticism, etc.)*
**subjection** (səb-jek′shən), *n.* (۱) خستنەژێر دەستەوە؛ مل پێ کەچ کردن؛ هێنانەژێر بار.
(۲) کەوتنەژێر دەستەوە یا ڕکێفەوە؛ ملکەچی.
**subjective** (səb-jek′tiv), *adj.* (۱) دەروونی؛ دەکەوێتە سەر دەروون و هەست و بیری کەسی نەك هۆی ڕاستەقینەی دەرەکی؛ خۆیی؛ کەسێتی: ( *a ~ judgment; a ~ interpretation of the story* ).
(۲) دەکەوێتە سەر هەست و نەست و بیروڕای هونەرمەندەکە یا نووسەرەکە.
(۳) بار یا شێوەی بکەر (ڕێزمان).
(٤) تەنها نەخۆشی هەستپێکردوو (نیشانەی نەخۆشی).
(٥) کەسی؛ خۆیی؛ ناوەکی؛ تەنها کەسەکە خۆی پێی دەزانێ (دەروونناسی).
-subjectively *(adv.)*; subjectiveness *(n.)*.
**subjectivism** (səb-jek′tiv-iz'm), *n.* خۆیەکێتی؛ خودی: بیرێکی فەلسەفییە دەڵێت: هەموو زانیارییەك دەکەوێتەسەر هەست و بەسەرهاتی خۆ.
**subjectivity** (sub´jek-tiv′ə-ti), *n.* (۱) تێڕوانینی هەموشتێك لە گۆشەی هەست و بیروڕای خۆوە؛ خۆیەتی؛ خۆیەکێتی.
(۲) گوێدان تەنها بە هەست و نەست و بیری خۆ.
(۳) دەرکەوتنی هەست و بیرو کەسێتی هونەرمەند لە بەرهەمەکانیدا.
**subject matter,** باس؛ بابەت.
**subjoin** (səb-join′), *v.t.* خستنەسەر لە دواوە؛ کردن بە پاشکۆ.
**subjoinder** (səb-join′dẽr), *n.* پاشکۆ.
**sub judice** (sub jōō′di-si), [L.], لە بەردەم دادپرسیدایە؛ لە دادگادایە؛ هێشتا بڕیاری لەسەر نەدراوە.
**subjugate** (sub′joo-gāt´), *v.t.* (۱) داگیرکردن؛ خستنەژێر دەستی خۆوە. (۲) مل پێ کەچ کردن؛ سەر پێ دانەواندن؛ کردنە بەند.
-subjugator *(n.)*.
**subjugation** (sub´joo-gā′shən), *n.* (۱) (ا) داگیرکردن.
(ب) مل پێ کەچ کردن؛ کردنە بەند.
(۲) ملکەچی؛ بەندێتی؛ بەندی؛ داگیرکران؛ ژێردەستەیی.
**subjunctive** (səb-juŋk′tiv), *adj.* تایبەتی بە باری مەرج، گومان، شیان، یا ئاواتەخوازی (ڕێزمان).
*n.* (۱) باری مەرج، گومان، شیان، یا ئاواتەخوازی (ڕێزمان).
(۲) کردارێکە لەم بارەدا (ڕێزمان).
**subkingdom** (sub´kiŋ′dəm, sub-kiŋ′dəm), *n.* تیرە (پۆل پۆل کردنی گیاندارو ڕووەك).
**sublease** (sub′lēs´), *n.* (۱) بەکرێدان لەلایەن کرێچییەوە (خانوو، زەویوزار). (۲) کرێنامەی لە کرێچی یەکەمەوە دراو بە کرێچی دووەم.
*v.t.* (۱) بەکرێدانی خانوو یا زەوی لەلایەن کرێگرتەوە.
(۲) بە کرێ گرتنی خانوو یا زەوی لە کرێچی.
**sublet** (sub-let′, sub′let′), *v.t.* (۱) بەکرێدانی خانوو لەلایەن کرێچییەوە بە کرێچییەکی تر.
(۲) ئیش وکار دان بە قۆنتەراتچی بچووك لەلایەن قۆنتەراتچی گەورەوە.
(۳) [Colloq.]، خانووی بە کرێ گیراو لە کرێچی.
**sublieutenant** (sub´lū-ten′ənt), *n.* ئەفسەری یەك ئەستێرە (هێزی دەریایی).
**sublimate** (sub′lə-māt´), *v.t.* (۱) پوختەکردنی ماددەی ڕەق بە گەرم کردنی و خەستکردنەوەی هەڵمەکەی (کیمیا).
(۲) پاکردنەوە (ڕەووشت)؛ خاوێن کردن؛ جوان کردن (ڕەفتار، کردەوە).

(٢) بەرزکردنەوە؛ پەستنەوەی حەزو ئارەزووی نزمو ناپەسەند (بەتایبەتی جووت بوون) و دەربڕینیان لە ڕێی ڕەووشتو کرداری جوانو بەرزەوە (دەروونناسی).

***v.i.*** بەرزبوونەوە؛ دەربڕان لە ڕێی ڕەووشتی بەرزەوە (ئارەزووی نزم یا ناپەسەند).

***adj.*** مەزن؛ بەرز (ڕەووشت، کردەوە).

**sublimation** (sub´lə-mā′shən), ***n.*** (١) پوختەکردن؛ پاکردنەوە؛ خاوێن کردن (٢) بەرزکردنەوە؛ دەربڕینی حەزو ئارەزووی نزمو ناپەسەند (وەك جووت بوون) لە ڕێی ڕەووشتو کرداری بەرزو جوانەوە (دەروونناسی). (٣) ئەنجامی ئەم خاوێن کردنەوەیە؛ حەز یا ئارەزووی بەرزو جوان کراو.

**sublime** (sə-blīm′), ***adj.*** (١) مەزن؛ بەرز: ***( ~ poetry )*** .
(٢) زۆر جوان؛ بەشکۆ؛ مەزن: ***( Switzerland has ~ scenery.)*** .
(٣) نایاب؛ زۆر خۆش: ***( a ~ dinner )*** .
(٤) [Archaic]، لووت بەرز؛ لەخۆبایی.
(٥) [Archaic]، بەرز.

***n.* ( the ~ ),** نموونەی مەزنیو بەرزیو جوانیو خۆشی.

***v.t.*** (١) مەزن کردن؛ بەرزکردنەوە؛ شکۆپێدان.
(٢) پاکردنەوەی ماددەیەکی ڕەق بە گەرم کردنیو خەستکردنەوەی هەڵمەکەی (کیمیا)

**-sublimely *(adv.)*; sublimeness *(n.)*.**

**sublimimal** (sub-lim′ə-n'l, sub-lī′mə-n'l), ***adj.*** (١) هەستی پێ ناکرێ (لەبەر کەمی). (٢) هی ئاناگا؛ هی ئاناگایی؛ کاردەکاتە سەر مرۆڤ بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ: ***( ~ advertising; the ~ mind )*** .

**sublimity** (sə-blim′ə-ti), ***n.*** (١) مەزنی؛ بەرزی؛ شکۆ؛ بەشکۆیی؛ جوانی (٢) شتێکی مەزن، بەرز، یا بەشکۆ.

**sublingual** (sub-liŋ′gwəl), ***adj.*** ژێر زمانی (زمانەوانی)؛ لەژێر زماندایە

**sublunar** (sub-lōō′nēr), ***adj.* = sublunary.**

**submachine gun,** گوللەپرژێن؛ شەستتیر؛ ڕەشاش.

**submarginal** (sub-mär′ji-n'l), ***adj.*** (١) نزیك پەراوێز؛ نزیك قەراغ. (٢) بێ پیت؛ بێ سوود.
(٣) کەمترە لە پەڕی ئەم پەڕی پێویست: ***( ~ economic conditions )*** .

**submarine** (sub′mə-rēn´), ***adj.*** هی ژێردەریا؛ تایبەتی بە ژێرئاو یا ژێردەریا

***n.*** (١) گیاندار یا ڕووەکی ژێرئاو
(٢) ژێردەریایی؛ کەشتی جەنگی ژێرئاو.

***v.t.*** هێرش کردنە سەر بە ژێردەریایی.

**submarine chaser,** ڕاوەنەری ژێردەریایی: بەلەمێکی بچووکە بۆ ڕاوانو هێرش بردنە سەر ژێردەریایی.

**submariner** (sub′mə-rēn´ēr), ***n.*** ئەفسەر یا دەریاوانی ژێردەریایی

**submaxilla** (sub´mak-sil′ə), ***n.*** کاژێری خوارەوە؛ شەویلگی خوارەوە؛ ئێسقانی شەویلگەی خواروو.

**submaxillary** (sub′mak′si-ler´i), ***adj.*** (١) هی کاژێر یا شەویلگی خواروو؛ هی کاژێری خواروو.
(٢) هی لیکەڕژێن (کە لەژێر کاژێری خواروودایە).

***n.*** ئەندامی ژێر کاژێری خواروو (وەك لیکەڕژێن، دەمارە خوێن... هتد).

**submerge** (səb-mūrj′), ***v.t.*** (١) نوقوم کردن؛ کردن بە ژێر ئاوەوە.
(٢) بە ئاو داپۆشین؛ کردن بە ژێرەوە: ***( Flood ~d the town.)*** .
(٣) شاردنەوە؛ داپۆشین.

***v.i.*** نوقوم بوون؛ بوون بە ژێر ئاوەوە؛ چوونە ژێر ئاو (ژێردەریایی).

**submerged** (səb-mūrjd′), ***adj.*** (١) نوقوم بوو؛ نوقوم؛ بە ئاو داپۆشراو (٢) لە ژێر ئاودا دەڕوێت یا دەژی.
(٣) بەناخداچوو لە هەژاریو نەگبەتیدا
(٤) شاراوە؛ داپۆشراو.

**submergence** (səb-mūr′jəns), ***n.*** نوقوم بوون؛ داپۆشران؛ بوون بەژێر ئاوەوە.

**submerse** (səb-mūrs′), ***v.t.* = submerge.**

**submersed** (səb-mūrst), ***adj.*** (١) نوقوم بوو؛ بە ئاو داپۆشراو.
(٢) لەژێر ئاودا دەژی؛ ژێرئاوی: ***( ~ weeds )*** .

**submersible** (səb-mūr′sə-b'l), ***adj.*** (١) دەخرێتە ژێر ئاوەوە.
(٢) لەژێر ئاودا کار دەکات

***n.*** ژێردەریایی.

**submersion** (səb-mūr′shən, səb-mūr′zhən), ***n.*** نوقوم کردن؛ لە ئاودا نوقوم بوون؛ بوون بە ژێر ئاوەوە.

**submicroscopic** (sub´mī-krə-skop′ik), ***adj.*** بە گەردبین نابینرێ؛ لە بچووکیدا بە میکرۆسکۆب نابینرێ.

**subminiature,** زۆر بچکۆلە.

**submiss** (səb-mis′), ***adj.* [Archaic], = submissive.**

**submission** (səb-mish′ən), ***n.*** (١) خۆ بەدەستەوەدان؛ ملدان؛ مل کەچ کردن. (٢) ملکەچی؛ مل شۆڕی؛ سەرشۆڕی؛ خۆ بەدەستەوەدان.
(٣) پێشکەش کردن (بۆ بڕیاردان یا لێکدانەوە).

**submissive** (səb-mis′iv), ***adj.*** ملکەچ؛ مل شۆڕ؛ خۆ بەدەستەوەدەر بە ئاسانی.

**submit** (səb-mit′), ***v.t.*** (١) پێشکەش کردن (بۆ لێکۆڵینەوە یا بڕیاردان)؛ پێدان: ***( to ~ a report )*** .
(٢) مل (بۆ) کەچ کردن؛ سەر بۆ دانەواندن؛ ملدان؛ کۆڵدان؛ خۆ بەدەستەوەدان
(٣) پێشنیازکردن؛ ڕا دەربڕین.

***v.i.*** خۆ بەدەستەوەدان؛ مل کەچ کردن؛ ملدان؛ کۆڵدان.

**submittal *(n.)*.**

**submontane** (sub-mon′tān), ***adj.*** (١) لە دامێنی شاخدایە.
(٢) دامێنە شاخی یا گردی. (٣) ژێر شاخ.

**submultiple** (sub-mul′ti-p'l), ***n.*** ژمارەی بەسەردا بەشکراو بەبێ دواماوە: ***( 3 is the ~ of 12.)*** .

**subnormal** (sub-nôr′m'l), ***adj.*** خوار ئاسایی (بەتایبەتی لە زیرەکیدا).

***n.*** کەسێکی خوارئاسایی.

**-subnormality *(n.)*.**

**suboceanic** (sub´ō-shi-an′ik), ***adj.*** ژێر زەریایی؛ هی ژێر بنی ئۆقیانووس.

**suborder** (sub′ôr´dēr, sub-ôr′dēr), ***n.*** لقی تیرە (پۆل پۆل کردنی گیانەوەرو ڕووەك).

**subordinate** (sə-bôr′də-nit), ***adj.*** (١) خوارتر (پلە)؛ پاشکۆ؛ ناسەرەکی: ***( a ~ position )*** .
(٢) خواردەست؛ بەردەستە؛ ژێردەستە.
(٣) ملکەچ؛ خۆ بەدەستەوەدەر
(٤) (ا) ناسەرەکی (ڕێزمان)؛ تایبەتی بە ساڕستەی ناسەرەکی یا پاشکۆ:
***( a ~ clause )***
(ب) ئامرازی لێکدەری دەستپێکەری ئەم جۆرە ساڕستەیە (کە پێیان دەوترێ: " **subordinate conjunction** ").
(دوو ووشەی دوای ئەمە ببینە).

***n.*** کەسێکی خواردەست؛ کەسێك یا شتێکی ناسەرەکی یا پاشکۆ.

***v.t.*** (١) بەبێ بایەختر دانان؛ بە پلە کەمتر یا نزمتر دانان؛ خستنە پلەیەکی نزمترەوە؛ بە ناگرنگتر دانان:
***( to ~ work to pleasure; to ~ passion to reason )***
(٢) خستنەژێر دەستەوە؛ دابینکردن.

**subordinate clause = dependent clause.**

**subordinate conjunction,** ئامرازی لێکدەری دەستپێکەری ساڕستەی ناسەرەکی (ڕێزمان): (وەك **who, that, which, if, etc.** )

**subordination** (sə-bôr´də-nā′shən), ***n.*** (١) خواردەستی؛

ژێردەستەیی؛ خواردەست کردن. (٢) ناسەرەکێتی؛ پاشکۆیەتی (ڕێزمان).
(٣) ملکەچی؛ گوێ ڕایەڵی.

**suborn** (sə-bôrn′), *v.t.* (١) هاندان بۆ تاوان کردن؛ کاری خراپە یا قەدەغە پێ کردن. (٢) (ا) درۆ پێ کردن؛ هاندان بۆ شایەتی درۆدان.
(ب) بەرتیل پێدان بۆ شایەتی درۆدان لە دادگا.
**-subornation** *(n.)*.

**suboxide** (sub-ok′sīd, sub-ok′sid), *n.* ئۆکسیدی کەم ئۆکسجین (کیمیا).

**subphylum** (sub-fī′ləm), *n.* بەش (پۆل پۆل کردنی زیندەوەر).

**subplot** (sub′plot′), *n.* پیلانی ناسەرەکی چیرۆک؛ پیلانە بچکۆلەی چیرۆک.

**subpoena, subpena** (sə-pē′nə, səb-pē′nə), *n.* یادنامەی بانگکردنە دادگا. فەرمانێکە بۆ بانگکردنی کەسێک بۆ دادگا یا کۆمیتەیەکی پەرلەمان بۆ لێپرسینەوە یا شایەتیدان.
*v.t.* فەرمان پێ کردن بۆ چوونە دادگا یا کۆمیتەیەکی پەرلەمان بۆ لێپرسینەوە یا شایەتیدان؛ بانگکردن بۆ ئەم مەبەستە.

**subprincipal** (sub-prin′sə-p′l), *n.* (١) یاریدەدەری بەڕێوەبەری قوتابخانە. (٢) کۆڵەکەی بچووک (لە چوارچێوەیەکدا).

**subregion** (sub′rē′jən), *n.* کەرتە ناوچە (لەڕووی دابەشبوونی گیاندارو ڕووەکەوە).

**subreption** (səb-rep′shən), *n.* (١) ڕاستی نەووتن بۆ سوودی خۆ؛ ڕاستی شاردنەوە؛ درۆکردن. (٢) سوود وەرگرتن لەم ڕاستی شاردنەوەیە.

**subrogate** (sub′rə-gāt′), *v.t.* گۆڕینەوەی کەسێک بە کەسێکی تر (بەتایبەتی خاوەن قەرز).

**subrogation** (sub′rə-gā′shən), *n.* گۆڕینەوەی خاوەن قەرزێک بە خاوەن قەرزێکی تر.

**sub rosa** (sub rō′zə), [L.]. بە نهێنی؛ بە دزییەوە.

**subscapular** (sub-skap′yoo-lēr), *adj.* ژێر دەفەی شان (توێکاری)؛
*n.* ماسولکە یا دەماری خوێنی ژێر دەفەی شان.

**subscribe** (səb-skrīb′), *v.t.* (١) ئیمزاکردن؛ مۆرکردن.
(٢) لایەنگیری کردن؛ پاڵپشتی کردن؛ پەسەندکردن.
(٣) بەڵێندان بە کۆمەک کردن؛ پارەدان (پیتاک):
*( He ~s large sums to charities.)*
*v.i.* (١) ئیمزاکردن؛ مۆرکردن.
(٢) پەسەندکردن؛ لایەنگیری کردن؛ ڕا لەگەڵ بوون
*( He ~s to the view that all men are created equal.)*
(٣) بەڵێنی پیتاکدان؛ کۆمەک کردن: *( She ~s to charities.)*.
(٤) بەشداربوونی ڕۆژنامەو گۆڤار بە ئابوونە:
*( to ~ to a newspaper or magazine )*
**-subscriber** *(n.)*.

**subscription** (səb-skrip′shən), *n.* (١) ئیمزاکردن؛ مۆرکردن.
(٢) بڕوانامەی ئیمزاکراو. (٣) (ا) بەشداری (ڕۆژنامە، گۆڤار)؛ هاوبەش بوون.
(ب) ئابوونە. (٤) پەسەندکردن؛ لایەنگیری
(٥) (ا) پیتاک کۆکردنەوە؛ کۆمەک بۆ کردن. (ب) پیتاک؛ باربوو.

**subsection** (sub-sek′shən, sub′sek′shən), *n.* کەرتە بەش؛ پارچەی پارچە

**subsequence** (sub′si-kwəns), *n. Also* subsequency. (١) پاشکۆیی؛ دوابەدوایی؛ دوابەدوا هاتن. (٢) پاشکۆ؛ ڕووداوی دوابەدوا.

**subsequent** (sub′si-kwənt, sub′si-kwent′), *adj.* داهاتوو؛ دوایی؛ دوابەدوا
**subsequent to,** دوابەدوای؛ لە دوای؛ لە پاش

**subsequently** (sub′si-kwənt-li), *adv.* لەپاشا؛ لەپاشانا؛ پاشان؛ پاش ئەوە؛ دوای ئەوە؛ دوابەدوای ئەوە

**subserve** (səb-sûrv′), *v.t.* یارمەتیدان؛ بۆ بەکەڵک بوون.

**subservience** (səb-sûr′vi-əns), *n. Also* subserviency, (١) بۆ بە کەڵک بوون؛ سوود. (٢) خواردەستێتی؛ ژێردەستێتی؛ پاشکۆیەتی
(٣) ملکەچی؛ نۆکەری؛ ڕەووشتی نۆکەرانە؛ گوێ ڕایەڵی لەڕادەبەدەر.

**subservient** (səb-sûr′vi-ənt), *adj.* (١) بەکەڵک؛ سوود لێ وەرگیراو.
(٢) خواردەست؛ ژێردەستە. (٣) ملکەچ؛ کڕنووشبەر؛ زۆر گوێ ڕایەڵ.
**-subserviently** *(adv.)*.

**subshrub** (sub′shrub′), *n.* بنچک.

**subside** (səb-sīd′), *v.i.* (١) نیشتن (خلتە).
(٢) (ا) نیشتنەوە (لافاو، پلەی ئاو). (ب) بەناخداچوون.
(٣) دامرکانەوە؛ هێمن بوونەوە؛ کزبوون؛ کەمبوونەوە؛ سووک بوون؛ هێواش بوونەوە: *( The storm ~d.; Violence has ~d.)*.
(٤) وورده وورده دانیشتن؛ نوقوم بوونە ناو کورسی.
**-subsidence** *(n.)*.

**subsidiary** (səb-sid′i-er′i), *adj.* (١) یاریدەدەری؛ پاشکۆیی: *( - details )*
(٢) ناسەرەکی؛ لقی: *( a ~ company )*.
(٣) هی دەستگیرۆیی؛ هی یارمەتی پارە: *( a ~ payment to an ally )*
*n.* (١) یاریدەدەر (مرۆڤ، شت)؛ ناسەرەکی.
(٢) subsidiary company.

**subsidiary company,** کۆمپانیای پاشکۆ: کۆمپانیایەکە کە لە نیوەی سەرمایەکەی زیاتر هی کۆمپانیایەکی تر بێ.
(پێشتر دەووترێ: " subsidiary ").

**subsidize** (sub′sə-dīz′), *v.t.* (١) یارمەتیدان بە پارە (بەتایبەتی لە میرییەوە بۆ کۆمپانیایەک یا وولاتێکی تر).
(٢) پاڵپشتی یا یارمەتی لایەک کرین بە پارە؛ بە بەرتیل کڕین؛ بەرتیل پێدان.
**-subsidization** *(n.)*; **subsidizer** *(n.)*.

**subsidy** (sub′sə-di), *n.* یارمەتی پارە؛ کۆمەک (پارە)؛ بەتایبەتی:
(ا) لە میرییەوە بۆ کۆمپانیایەک یا کەسێک. (ب) لە میرییەوە بۆ وولاتێکی تر.
(ج) لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر.
(د) لە پەرلەمانی ئینگلیزییەوە بۆ پاشای ئینگلتەرە.

**subsist** (səb-sist′), *v.i.* (١) بەردەوام بوون؛ مان؛ بەردەوام بوون لە ژیاندا. (٢) گوزەران (پێ) کردن؛ پێ ژیان؛ ژیان؛ پێ دەربردن:
*( to ~ on vegetables; Some families ~ on very little.)*
(٣) لەوە پێکهاتن؛ لەوەدابوون؛ تێدابوون.
(٤) ڕێ تێ چوون؛ بەجێ بوون؛ بە مێشکدا چوون؛ ڕاست بوون.
*v.t.* ژیاندن؛ بەخێوکردن.

**subsistence** (səb-sis′təns), *n.* (١) بوون؛ مان؛ بەردەوام بوون.
(٢) تێدابوون؛ پێکهاتن؛ لەوەدابوون. (٣) (ا) گوزەران؛ گوزەران کردن؛ ژیان (بەتایبەتی هی کولەمەرگی یا مەمرەومەژی).
(ب) هۆی گوزەران؛ دەرامەت.
(٤) ڕێ تێ چوون؛ بەجێیی؛ بەجێ بوون؛ بە مێشکدا چوون؛ ڕاست بوون.

**subsistent** (səb-sis′tənt), *adj.* (١) ماوە؛ هێشتا دەژی یا هەیە؛ هێشتا بەردەوامە؛ هەیە. (٢) بوونی لەوەدایە؛ ماناوەی لەوەدایە.

**subsoil** (sub′soil′), *n.* ژێرخاک؛ چینی ژێرخاک.
*v.t.* هەڵگێڕانەوەی ژێرخاک.

**subsolar** (sub-sō′lēr), *adj.* (١) ژێرخۆری؛ هی ژێر ڕۆژ.
(٢) جیهانی؛ سادە؛ ئاسایی. (٣) هی کەمەرەی زەوی.

**subsonic** (sub′son′ik), *adj.* کەمتر لە خێرایی دەنگ؛ لە خوار خێرایی دەنگەوە.

**subspecies** (sub-spē′shiz, sub′spē′shiz), *n.* کەرتە توخم (هاوپۆل کردنی زیندەوەر)؛ لقە توخم.

**substance** (sub′stəns), *n.* (١) ماددە؛ شت: *( Iron is a hard ~.)*
(٢) ناوەڕۆک؛ ناوکرۆک؛ ماک؛ نەژاد.
(٣) ڕاستی شت (فەلسەفە).

(٤) پتەوی؛ قەبارە؛ سەنگینی؛ بایەخ.
(٥) سامان ( *a man of ~* ).
**in substance,** (١) لە ناوەڕۆکدا؛ لە بارەی شتە گرنگەکانەوە.
(٢) لە ڕاستیدا
**substandard** (sub-stan'dẽrd), ***adj.*** (١) ناتەواو؛ خراپ؛ ناپەسەند.
(٢) ناپەسەند (شێوە زمان، زمان).
**substantial** (səb-stan'shəl), ***adj.*** (١) قەبارەدار
(٢) ڕاستەقینە (٣) پتەو؛ قایم: ( *a ~ building* ).
(٤) زۆر؛ گەورە؛ زل؛ ئەوتۆ؛ فرە: ( *a ~ meal; a ~ salary* ).
(٥) گرنگ؛ بنچینەیی:
*( There are ~ differences between them.)*
(٦) تا ڕادەیەکی زۆر؛ تەواو: ( *We are in ~ agreement.* ).
(٧) دەوڵەمەند؛ سامانداں.
***n.pl.*** (١) پێویستی‌یەکان؛ شتە گرنگەکان. (٢) شتە پتەوەکان.
**substantially** (səb-stan'shə-li), ***adv.*** (١) بەتوند؛ بەهێز؛ بەقایم.
(٢) لە ڕاستیدا (٣) تا ڕادەیەکی زۆر؛ بە زۆری.
**substantiate** (səb-stan'shi-āt´), ***v.t.*** (١) (ا) قەبارە پێدان.
(ب) چەسپاندن؛ جێگیرکردن؛ پتەوکردن. (٢) کردن بە ڕاستەقینە.
(٣) سەلماندن بە بەڵگە؛ بەڵگە بۆ هێنانەوە: ( *to ~ an ellegation* ).
**substantiation** (səb-stan´shi-ā'shən), ***n.*** (١) بەڵگە بۆهێنانەوە؛ سەلماندن بە بەڵگە؛ چەسپاندن. (٢) بەڵگە
**substantival** (sub´stən-tī'v'l), ***adj.*** ناوی؛ لە بریتی ناو بەکاردەهێنرێ (ڕێزمان).
**substantive** (sub'stən-tiv), ***adj.*** (١) سەربەخۆ
(٢) هەندێکی زۆر؛ ئەوتۆ؛ ئێجگار زۆر؛ زۆر؛ فرە. (٣) ڕاستەقینە.
(٤) گرنگ؛ بنچینەیی؛ ناوەڕۆکی. (٥) پتەو؛ چەسپیو؛ جێگیر.
(٦) تایبەتی بە کرداری بوون (ڕێزمان): ( *the ~ verb "to be"* ).
(٧) لە جێی ناو بەکارهێنراو (ڕێزمان).
***n.*** (١) شتێکی پتەو، چەسپیو، یا ڕاستەقینە.
(٢) (ا) ناو (ڕێزمان) (ب) دەستە ووشەی بەکارهێنراو لە جێی ناو (ڕێزمان).
-substantively ***(adv.)***; substantiveness ***(n.)***.
**substation** (sub'stā´shən), ***n.*** (١) ئێستگەی لقی (کارەبا).
(٢) پۆستەخانەی بچووک.
**substitutent** (sub´stə-tōō'tənt), ***n.*** بریتی کار گەردیلەیەک یا کۆمەڵە گەردیلەیەکە کە لەباتی گەردیلەیەک یا کۆمەڵە گەردیلەیەکی تر بەکاردەهێنرێ لە ناوێتەیەکی کیمیاییدا
***adj.*** تایبەتی بە گەردیلەیەک یا کۆمەڵە گەردیلەیەکی وەها.
**substitute** (sub'stə-tōōt´, sub'stə-tūt´), ***n.*** (١) بریکار؛ بریتی (مرۆڤ، شت، گیاندار)؛ جێگر؛ شتی لەباتی.
(٢) ووشەی بریکار (ڕێزمان): ووشەی بەکار هێنراو لەباتی ووشەیەکی تر (وەک ڕاناو یا ووشەی " did " لەم ڕستەیەدا:
*( She shouted and so did he.)*
***v.t.*** ( **~ for** ), جێگرتنەوە؛ بریکاری کردن؛ ئیش کردن لەباتی:
*( He ~s for teachers when they get sick.)*
**substitution** (sub´stə-tōō'shən, sub´stə-tū'shən), ***n.*** (١) گۆڕینەوە (مرۆڤ، شت... هتد)؛ بریکاری؛ خستنە جێ؛ جێ گرتن.
(٢) بریکار؛ شت یا مرۆڤی جێگر؛ بریتی کار.
**substitutive** (sub'stə-tōō´tiv, sub'stə-tū´tiv), ***adj.*** (١) هی بریکاری؛ تایبەتی بە گۆڕینەوە یا جێگرتنەوە.
(٢) جێگرەوە؛ بریکار؛ بۆی هەیە جێی کەسێك یا شتێکی تر بگرێتەوە.
**substrate** (sub'strāt), ***n.*** ماددەی ئەنزیم یا هەوێن کارتێکردوو.
**substratosphere** (sub-strat'ə-sfēr´), ***n.*** خوار ستراتۆسفێر. چینی خوارووی بۆشایی ئاسمانە کە لە سێ میل‌و نیو لە ژوور زەمینەوە دەستپێدەکات هەتا حەوت میل)
**substratum** (sub-strā'təm, sub'strat´əm), ***n.*** (١) بناغە؛ بنچینە؛ چینی ژێرەوە. (٢) **subsoil**.
(٣) شوێنی ژیانی زیندەوەر:
*( The soil is the ~ of most seed plants.)*
(٤) ماددەی ئەنزیم یا هەوێن کارتێکردوو.
(٥) ماددەی شت لێ پێکهاتوو
**substruction** (sub-struk'shən), ***n.*** = **substructure.**
**substructure** (sub-struk'chẽr), ***n.*** (١) بناغە؛ بنچینە؛ چینی ژێرەوە. (٢) بناغەی هێڵی شەمەندەفەر.
**subsume** (səb-sōōm', səb-sūm'), ***v.t.*** هاوپۆل کردن؛ هاوبابەت کردن لەگەڵ بابەتێکی گەورەتردا؛ گرتنەوە بە ڕێسا یا پەیڕەوێکی گشتی.
**subsumption** (səb-sump'shən), ***n.*** (١) هاوپۆل کردن؛ هاوبابەت کردن. (٢) شتی هاوپۆل کراو یا هاوبابەت کراو لەگەڵ پۆلێکی گەورەتردا (بەتایبەتی بیروڕا یا گریمانە).
**subteen** (sub'tēn), ***n.*** هەرزەی لە سیانزە ساڵ منداڵتر (بەتایبەتی کچ).
**subtemperate** (sub-tem'pẽr-it), ***adj.*** (١) خوار مام ناوەندی (ئاووهەوا)؛ فێنکتر لە ئاووهەوای مام ناوەندی: ( *a ~ climate* ).
(٢) تایبەتی بە ناوچە فێنکترەکانی هەرێمی مام ناوەندی خرۆکی زەوی.
**subtenancy** (sub-ten'ən-si), ***n.*** (١) بە کرێ گرتن لە کرێچی.
(٢) ماوەی ئەم بە کرێ گرتنە
**subtenant** (sub-ten'ənt), ***n.*** کرێچی کرێچی؛ کرێ چی‌یەکە کە خانوو بە کرێ دەگرێت لە کرێ چی‌یەکی تر.
**subtend** (səb-tend'), ***v.t.*** (١) درێژبوونەوە بە ژێردا.
(٢) بەرامبەربوون‌و سنوور بۆ دانان:
*( Each side of a triangle ~s the opposite angle.)*
**subter-** (sub'tẽr), پێشگرێکە بەمانای: لەژێر؛ لەژێرەوە؛ بەنهێنی؛ کەمتر لە.
**subterfuge** (sub'tẽr-fūj´), ***n.*** فێڵ‌وتەڵەکە؛ فێڵبازی؛ بیانوو؛ فێڵ‌وتەڵەکەی خۆ پەڕاندنەوە یا دەربازکردن لە شتێکی ناخۆش.
**subternatural** (sub´tẽr-nach'ẽr-əl), ***adj.*** خوار سرووشت.
**subterranean** (sub´tə-rā'ni-ən), ***adj.*** (١) ژێرزەمینی؛ لەژێر ڕووی زەمیندا. (٢) نهێنی؛ شاراوە.
**subterraneous** (sub´tə-rā'ni-əs), ***adj.*** = **subterranean.**
**subtile** (sut''l, sub'til), ***adj.*** = **subtle.**
**subtility** (səb-til'ə-ti), ***n.*** = **subtlety.**
**subtilize** (sut''l-īz´, sub't'l-īz´), ***v.t. & v.i.*** (١) ناسک کردن؛ هەڵکشاندن؛ بەرزکردنەوە؛ پوختەکردن. (٢) بەووردی‌و زۆرزانانە لێکدانەوە
-subtilization ***(n.)***.
**subtilty** (sut''l-ti, sub't'l-ti), ***n.*** = **subtlety.**
**subtitle** (sub'tī´t'l), ***n.*** (١) سەرباسی بچووک (پەڕتووک، شانۆگەری)؛ سەرباسی لقی یا ناسەرەکی. (٢) سەرباسی یەکەم لاپەڕەی پەڕتووک.
(٣) (ا) نووسینی سەر پەردەی سینەمای فیلمی بێ دەنگ (کە چیرۆک‌و گفتوگۆی فیلمەکە ڕوون دەکاتەوە). (ب) گفتوگۆی گۆڕاو بۆ زمانێکی ترو نووسراو لەسەر پەردەی سینەما.
**subtle** (sut''l), ***adj.*** (١) تەنك؛ ناسك.
(٢) (ا) بە ئاستەم هەستی پێ دەکرێ؛ هەستی پێ ناکرێ؛ ناسك:
*( a ~ fragrance )*
(ب) وورد؛ بە ئاستەم هەستی پێ دەکرێ؛ شاراوە؛ نادیار:
*( There are ~ differences between the two styles.)*
(٣) زیرەك؛ بزان؛ لێهاتوو؛ کارامە: ( *a ~ scholar* ).
(٤) زۆرزانانە کراوە؛ کارامانە کراوە: ( *a ~ argument* ).
(٥) فێڵباز؛ تەڵەکەباز؛ زۆرزان؛ نۆینباز؛ قومارباز.
(٦) ئاڵۆز؛ گران؛ قورس: ( *a ~ problem* ).
(٧) نهێنگر (مەجاز)؛ لەژێرەوە زیانبەخش؛ پیس: ( *a ~ poison* )
-subtleness ***(n.)***; subtly ***(adv.)***.

(٢) بێ دەنگ (تیپی زمان).
***n.*** (١) ڕەگەکوێرە (بیرکاری). (٢) تیپی بێ دەنگ (زمان).
**sure** (shoor), ***adj.*** (١) [Obs.] ، بێ مەترسی؛ مەترسی لێ ناکرێت.
(٢) هەمیشە سەرکەوتوو؛ مەترسی سەنەکەوتنی لێ ناکرێت:
***( a ~ method; a ~ remedy)***
(٣) پشت پێ بەستراو.
(٤) بێ گومان؛ ڕاست. ***( ~ proof of his innocence)*** .
(٥) چەسپیو؛ پتەو: ***( ~ convictions)*** .
(٦) دڵنیا ***( Are you ~ of your facts?; ~ of victory)*** .
(٧) هەر دەبێت ببێت. (٨) مسۆگەر: ***( He is ~ to lose.)*** .
(٩) هەمیشە دەی پێکێت: ***( a ~ aim)*** .
***adv.*** [Colloq.], بێ گومان: دڵنیا
**for sure,** بێ گومان: بەبێ گومان.
**make sure,** دڵنیابوون: دڵنیا بە!.
**sure enough,** [Colloq.], بێ گومان: هەر وەك چاوەڕوانی لێ دەکرا.
**to be sure,** بێ گومان: گومانی تێدا نییە.
**sure-enough** (shoor′i-nuf′), ***adj.*** [Colloq.], ڕاستەقینە؛
ڕاست: ڕەسەن.
**sure-fire** (shoor′fīr′), ***adj.*** [Colloq.], سەرکەوتنی مسۆگەرە.
**sure-footed** (shoor′foot′id), ***adj.*** پێ هەڵنەکەوتوو؛ پێ دانەچوو؛
هەڵەنەکەر: کاری خۆ زانیو؛ پشت ئەستوور.
**surely** (shoor′li), ***adv.*** (١) بە دڵنیایی: بە پشت ئەستووری.
(٢) بێ گومان ***( S~ you don't believe that!)*** .
**surety** (shoor′ti, shoor′ə-ti), ***n.*** (١) بڕوا بە خۆ بوون؛ بڕوا بە خۆ
کردن. (٢) بێ گومانی؛ دڵنیایی. (٣) دەستەبەری. (٤) دەستەبەر.
**surf** (sûrf), ***n.*** شەپۆلی کەنار دەریا.
***v.i.*** ئاوەخلیسکێ کردن بە تەختە بەسەر شەپۆلی کەنار دەریادا؛
شەپۆل خلیسکێ کردن.
**surface** (sûr′fis), ***n.*** (١) لا. (٢) ڕوو (ئەندازە).
(٣) ڕووالەت؛ ڕووکەش؛ ڕووکار. (٤) **airfoil** .
***adj.*** ڕووالەتی: ڕووکەشی؛ لەڕوو؛ سەرزاری؛ هەر لەڕوو:
***( ~ politness; ~ impressions )***
***v.t.*** (١) ڕووی تایبەتی بۆ کردن؛ دیوی دەرەوەی چاکردن؛ ساف و لووس کردن؛
ڕێك کردن (٢) هێنانە سەر ئاو (ژێردەریایی).
***v.i.*** (١) کان کردن لە نزیك ڕووی زەویدا. (٢) هاتنە سەر ئاو (ژێردەریایی)؛
سەر ئاو کەوتن. (٣) سەر دەرهێنان؛ هاتنەڕوو؛ دەرکەوتن.
**on the surface,** لەڕوو؛ بە ڕوو؛ بە سەرزاری؛ بە ڕووالەت.
**surface plate,** = **planometer.**
**surfbird** (sûrf′bûrd′), ***n.*** باڵندەیەکی بچووکی کلك پانی کەناردەریایە.
**surfboard** (sûrf′bôrd′, sûrf′bōrd′), ***n.*** تەختەی ئاوەخلیسکێ
(لە کەناری دەریادا)؛ تەختەی شەپۆل خلیسکێ: تەختەیەکی
باریك و درێژ و سووکە بۆ سواربوونی شەپۆلی شکاوەی کەنار دەریا.
**surfboat** (sûrf′bōt′), ***n.*** بەلەمی شەپۆلی: بەلەمێکی سووك و قایمە لە
دەریای هەڵچوو و شەپۆلی زلدا بەکار دێت.
**surf-duck,** = scoter.
**surfeit** (sûr′fit), ***n.*** (١) ئێجگار زۆر؛ زەبەنە؛ لە ئەندازە بەدەر.
(٢) زۆر حواردن؛ زیادەخۆری؛ زۆر تێرخواردن.
(٣) ئێنتەلا؛ سك ئێشان بەهۆی زۆر خواردنەوە.
(٤) لەبەرچاو کەوتن (لەبەر زۆر و زەبەنەیی).
**surfer** (sûrf′ẽr), ***n.*** شەپۆل خلیسکێکەر؛ ئاوەخلیسکێکەری کەنار دەریا.
**surf-fish,** ماسییەکی بچووکی کەناری دەریای پاسیفیکە.
**surficial** (sûr′fish′əl), ***adj.*** هی سەر ڕووی زەوی.
**surfing** (sûrf′iŋ), ***n.*** یاریی شەپۆل خلیسکێ؛ یاری ئاوەخلیسکێی
کەنار دەریا.
**surge** (sûrj), ***n.*** (١) شەپۆلی گەورە؛ شەپۆلی بەتین.
(٢) لێشاو؛ لافاو؛ ووروژم:
***( the ~ of the sea; a ~ of pity, anger, etc.)***
(٣) تەووژم (ئەلەکتریك).
***v.i.*** (١) شەپۆلدان.
(٢) لێشاو بردن؛ ووروژم هێنان؛ وەك لافاو هەڵسان:
***( A big crowd ~d out of the stadium.)***
(٣) هەڵچوون (هەست)؛ هاتنە جۆش.
(٤) شل بوونەوەی پەتی چەرخی لەنگەر هەڵکردنی کەشتی.
***v.t.*** شل کردنەوەی پەتی چەرخی لەنگەر هەڵکردنی کەشتی.
**surgeon** (sûr′jən), ***n.*** نەشتەرگەر؛ نەشتەرکار؛ برینساز.
**surgeoncy** (sûr′jən-si), ***n.*** پلەی نەشتەرگەر؛ پلەی نەشتەرکار؛
برینکار.
**surgeon-fish** (sûr′jən-fish′), ***n.*** ماسییەکی ڕەنگاوڕەنگی ئارچە
گەرمەکانە دڕکێکی وەك تیر بە بنی کلکییەوەیەتی.
**Surgeon General,** (١) سەرەك پزیشك (سوپای ئەمەریکی و
بەڕێوەبەرێتی پزیشکەوانی).
(٢) [s- g-] ، ئەندامی تیپی پزیشکی (سوپای ئینگلیزی).
**surgery** (sûr′jẽr-i), ***n.*** (١) نەشتەرگەری؛ نەشتەرکاری؛ برینکاری.
(٢) ژووری نەشتەرگەری؛ تاقیگەی نەشتەرکار.
(٣) فەرمانگەی پزیشك (ئینگلتەرە).
**surgical** (sûr′ji-k'l), ***adj.*** (١) هی نەشتەرگەری و نەشتەرگەران.
(٢) لە ئەنجامی نەشتەرگەرییەوەیە.
-surgically ***(adv.).***
**surly** (sûr′li), ***adj.*** (١) مۆن؛ مڕومۆن؛ مڕومۆچ؛ گرژ؛ ووشك (مەجان)؛
ڕووگرژ. (٢) [Rare or Obs.]، لووت بەرز؛ لەخۆبایی.
-surlily ***(adv.)***; surliness ***(n.).***
**surmise** (sẽr-mīz′), ***n.*** گۆترە؛ وا دانان؛ وا زانین؛ وا تێگەیشتن.
***v.t. & v.i.*** وا زانین؛ وا دانان؛ وا تێگەیشتن؛ وا بۆچوون
**surmount** (sẽr-mount′), ***v.t.*** (١) زیاتر بوون لە؛ لێ تێپەڕین.
(٢) زاڵبوون بەسەردا؛ بەسەردا سەرکەوتن. (٣) پیادا هەڵگەڕان.
(٤) بە تەوقەسەرەوە بوون؛ بە پۆپە یا سەرەوە بوون.
(٥) خستنەسەر؛ دانان لەسەر.
-surmountable ***(adj.).***
**surmullet** (sẽr-mul′it), ***n.*** جۆرێکە لە ماسی.
**surname** (sûr′nām′), ***n.*** (١) سەرناو؛ لەقەب؛ ناوی هۆز. (٢) نازناو.
***v.t.*** نازناو لێ نان؛ لەقەب لێ نان.
**surpass** (sẽr-pas′, sẽr-päs′), ***v.t.*** (١) باشتر بوون لە.
(٢) زیاتر بوون لە؛ تێپەڕ بوون؛ بۆڕ پێدان.
**surpassing** (sẽr-pas′iŋ, sẽr-päs′iŋ), ***adj.*** بێ هاوتا؛ بێ وێنە؛
ئێجگار زۆر: ***( monuments of ~ magnificence)*** .
**surplice** (sûr′plis), ***n.*** جبەیەکی سپی قەشەیە.
**surplus** (sûr′plus, sûr′pləs), ***n.*** شتی زیادە؛ زیادە؛ سەرباقی؛
شتی ناپێویست.
***adj.*** زیادە؛ زیاد لە پێویست.
**surplusage** (sûr′plus-ij), ***n.*** (١) زیادە؛ شتی ناپێویست.
(٢) ڕێسە؛ قسە درێژکردنەوە. (٣) شتی بێ پەیوەندی بە باسەکەوە (دادگەری).
**surprint** (sûr′print′), ***v.t.*** چاپکردن لەسەر شتێکی چاپکراوەوە.
***n.*** شتێکی چاپکراو لەسەر شتێکی چاپکراوی ترەوە.
**surprisal** (sẽr-prī′z'l), ***n.*** (١) لەپڕ بەسەردادان.
(٢) سەرسوڕمان؛ سەرسامی؛ ناکاوی.
**surprise** (sẽr-prīz′), ***v.t.*** (١) لە ناکاو چوون بەسەردا؛ لەپڕ چوون
بەسەردا. (٢) ئاشبگیرکردن؛ لە ناکاو بەسەردادان؛ لەپڕ هێرش بردنە سەرو
داگیرکردن. (٣) سەرسوڕماندن؛ سەرسام کردن.
(٤) لە ناکاو و بە فێڵ نهێنی لێ دەرهێنان یا کاری نەویستراو پێ کردن.
***n.*** (١) هێرشی لە ناکاو؛ ناکاوی؛ بەسەردادانی لەپڕ.

(٢) سەرسامی؛ سەرسوڕمان؛ سەرسوڕماوی.
(٣) شتی سەرسوڕمێن یا سەرسامکەر
**take by surprise,** (١) لە ناکاو چوون بەسەردا؛ لەپڕ بەسەردادان
(٢) سەرسام کردن؛ سەرسوڕماندن:
***( His insane reaction took us completely by surprise.)***
**surprisedly** (sēr-prīz′id-li), ***adv.*** بە سەرسامییەوە؛
بە سەرسوڕمانەوە
**surprising** (sēr-prīz′iŋ), ***adj.*** سەیر؛ سەرسوڕمێن؛ سەرسوڕمێنەر.
**-surprisingly** ***(adv.).***
**surreal** (sə-rē′əl), ***adj.*** سریالی (هونەر، باروودۆخ... هتد)؛
لە ڕاستی ناچێت
**surrealism** (sə-rē′əl-iz′m), ***n.*** سریالیزم؛ سریالی؛ هونەری سریالی؛
لە ڕاستی نەچوو (هونەر).
**-surrealist** ***(n.)***; **surrealistic** ***(adj.)***; **surrealistically** ***(adv.).***
**surrebutter** (sŭr′ri-but′ēr), ***n. Also*** **surrebuttal,** وەڵامی
داواچی بۆ داوا لەسەر لە دادگادا
**surrejoinder** (sŭr′ri-join′dēr), ***n.*** وەڵامی داواچی بۆ داوا لەسەر
لە دادگادا
**surrender** (sə-ren′dēr), ***v.t.*** (١) بە دەستەوەدان؛ دان بەدەستەوە:
***( They ~ed the city to the enemy.)***
(٢) دەست لێ هەڵگرتن؛ وازلێهێنان: ***( We shall never ~ our liberty.)*** .
(٣) کۆڵدان. (٤) دانەوە؛ پێدانەوە.
***v.i.*** خۆ بەدەستەوەدان
***n.*** (١) بەدەستەوەدان (٢) خۆ بەدەستەوەدان. (٣) وازهێنان؛ دەستهەڵگرتن.
**surreptitious** (sŭr′əp-tish′əs), ***adj.*** نهێنی؛ پەنهان؛ پەنهانی؛
بە دزییەوە
**-surreptitiously** ***(adv.)***; **surreptitiousness** ***(n.).***
**surrey** (sŭr′i), ***n.*** گالیسکەی چوارپێچکەی دوو کورسی.
**surrogate** (sŭr′ə-gāt′), ***n.*** (١) بریکار؛ جێگر؛ نوێنەر؛ بریتی
(٢) دادپرسی وەسیەتنامەو میراتی بەش کردن.
***v.t.*** (١) لە جێ دانان؛ خستنەجێ؛ کردنە بریکار.
(٢) لە جێی خۆ دانان؛ کردنە نوێنەری خۆ.
**surround** (sə-round′), ***v.t.*** (١) دەورەدان؛ چواردەورگرتن؛
چواردەورەدان: ***( The house is ~ed by a wall.)*** .
(٢) گەمارۆدان؛ ئابڵووقەدان؛ دەورگرتن؛ دەورەدان.
**surroundings** (sə-round′iŋs), ***n.pl.*** دەوروبەر؛ دەوروپشت
***( The house is in beautiful ~ .)***
**surtax** (sŭr′taks′), ***n.*** سەرباج
***v.t.*** سەرباج لێسەندن؛ سەرباج لەسەر دانان.
**surtout** (sēr-to͞ot′, sēr-to͞o′), ***n.*** پالتۆی درێژو تەسکی پیاوانە.
**surveillance** (sēr-vā′ləns, sēr-vāl′yəns), ***n.*** (١) چاودێری
پۆلیس؛ سووسەگەری: ***( The suspects were under police ~ .)*** .
(٢) چاودێری؛ سەرکاری؛ سەرپەرشتی.
**surveillant** (sēr-vā′lənt, sēr-vāl′yənt), ***n.*** چاودێر (پۆلیس)؛
سووسەگەر
**survey** (sēr-vā′), ***v.t.*** (١) هەڵسەنگاندن؛ لێ وردبوونەوەو هەڵسەنگاندن.
(٢) لێ وردبوونەوە؛ بە وردی سەیرکردن.
(٣) پیاچوونەوە؛ باس کردن یا سەیرکردن بە گشتی:
***( He ~ed the international situation.)***
(٤) ڕووپێوان؛ پێوان (زەوی)؛ ئەندازەگرتن.
***n.*** (١) لێ وردبوونەوە؛ لێکۆڵینەوەی گشتی؛ هەڵسەنگان.
(٢) پیاچوونەوە یا سەیرکردنی گشتی.
(٣) ڕووپێوی؛ پێوان (زەوی)؛ ئەندازەگرتن.
(٤) زەوی پێوراو (٥) نەخشەی ئەم پێوانە.
**surveying** (sēr-vā′iŋ), ***n.*** ڕووپێوی؛ زەوی پێوی؛ پێوان.

**surveyor** (sēr-vā′ēr), ***n.*** زەوی پێو؛ ڕووپێو؛ پێوەر؛ ئەندازەگر.
**surveyor's level,** تەرازووی زەوی پێو یا ڕووپێو.
**surveyor's measure,** پێوانەی زەوی پێو یا ڕووپێو.
**survival** (sēr-vī′v′l), ***n.*** (١) مان؛ مانەوە؛ نەفەوتان؛ بەردەوام بوون؛
ژیان؛ بەردەوامی. (٢) شتی ماوە یا نەفەوتاو دوای نەمانی شتی تر.
**survival of the fittest,** مانی چاکتر؛ مانی ئەو زیندەوەرەی کە
باشتر لەگەڵ سرووشت و دەوروبەریدا خۆی دەگونجێنێت.
**survive** (sēr-vīv′), ***v.t.*** (١) مان؛ مان لە دوا یا زیاتر لە؛ بەردەوام بوون
لەدوای. (٢) مان (بەتایبەتی دوای کارەساتێك)؛ نەفەوتان؛ لەناونەچوون:
***( They ~d the car accident, shipwreck, etc.)***
***v.i.*** (١) مان؛ نەفەوتان؛ مانەوە؛ ژیان. (٢) دەربردن؛ هەڵکردن.
**survivor** (sēr-vī′vēr), ***n. Also*** **surviver,** ماو؛ کەسێکی ماو (پاش
نەمانی ئەوانی تر)؛ نەفەوتاو؛ خۆپارێز؛ نەمر:
***( He was the sole ~ of the accident.)***
**susceptibility** (sə-sep′tə-bil′ə-ti), ***n.*** (١) بۆ هەبوون؛ توانا.
(٢) (*pl.*)، هەست. (٣) زوو کارتێکران؛ هەستیاری؛ بە ئاسانی گۆڕان.
**susceptible** (sə-sep′tə-b′l), ***adj.*** (١) زوو کاری تێ دەکرێ؛
بەرهەڵستی نەکەر. (٢) زوو دەیگرێ (نەخۆشی گرتن)؛ بەرگە ناگرێ:
***( He's ~ to colds.)***
(٣) هەستیار؛ زوو هەستی دەجوولێ: ***( ~ to flattery )*** .
**susceptible of,** بۆی هەیە.
**susceptible to,** بە ئاسانی کاری تێ دەکرێ؛ زوو دەیگرێ (نەخۆشی):
***( susceptibe to tuberculosis )***
**susceptive** (sə-sep′tiv), ***adj.*** (١) زوو کاری تێ دەکرێ.
(٢) زوو وەرگر؛ وەرگر؛ کراوە.
**-susceptiveness** ***(n.)***; **susceptivity** ***(n.).***
**suslik** (sus′lik), ***n.*** (١) گیاندارێکی کرۆژەندەیە لە سمۆرە دەچێ.
(٢) کەوڵی ئەم گیانەوەرە.
**suspect** (sə-spekt′), ***v.t.*** (١) گومان لێکردن؛ گومان کردن؛
بەدگومانی لێکردن. (٢) گومانی تاوان لێکردن؛ گومانی تاوانباری لێ هەبوون.
(٣) لا وابوون؛ وا زانین؛ وا دانان.
***adj.*** گومان لێکراو.
***n.*** کەسێکی گومان لێکراو (بەتایبەتی بۆ تاوانباری)؛ گومانبار؛
گومانی تاوانکاری لێکراو؛ گومانی.
**suspend** (sə-spend′), ***v.t.*** (١) دەست کێشانەوە لە کار؛
دەرکردن بۆ سەردەمێك؛ لە ئیش وەستاندن:
***( to ~ a student from school)***
(٢) وەستاندن؛ ڕاگیرکردن؛ ڕاگرتن: ***( to ~ physical activity)*** .
(٣) ڕاگرتن (بڕیار)؛ وەستاندن؛ لەکارخستن؛ هێشتنەوە لە باری خۆیدا:
***( to ~ a sentence; to ~ judgment)***
(٤) هەڵواسین؛ ڕاهێڵان؛ داهێڵان؛ شۆڕکردنەوە:
***( to ~ a lamp from the ceiling)***
(٥) لە هەوادا ڕاگرتن بەبێ هیچ (وەك تەپوتۆز).
(٦) بە چاوەڕوانی هێشتنەوە؛ بەتەماکردن.
***v.i.*** (١) وەستان؛ دواکەوتن. (٢) پارە نەدانەوە؛ قەرز نەدانەوە.
**suspenders** (sə-spen′dērz), ***n.pl.*** (١) ئاسقی پانتۆڵ.
(٢) [British]، پووزەوانە؛ گێترە؛ ئاسقی گۆرەوی.
**suspense** (sə-spens′), ***n.*** (١) لە ئەگەرو نەگەردا بوون؛ ئامسۆگەری؛
ئەگەرونەگەری. (٢) بەتەمابوون بە دڵەڕاوکێوە؛ چاوەڕێ کردن بەبێ ئارامی
یا دڵەخورتەوە. (٣) ڕاگرتن (ڕووداو)؛ دواخستن.
**suspense account,** حسابی سەردەمی (دەفتەرگرتن).
**suspension** (sə-spen′shən), ***n.*** (١) (ا) دەست کێشانەوە لە ئیش؛
دەرکردن لە کار یا قوتابخانە بۆ سەردەمێك. (ب) وەستان (قەرز یا پارەدانەوە).
(ج) ڕاگرتن (بڕیار)؛ ڕاوەستان. (٢) هەڵواسین؛ ڕاهێڵان.
(٣) ئامێری شت پێدا هەڵواسراو یا ڕاهێڵراو. (٤) سپرینگی ژێر ئوتومبیل.

(٥) هەڵواسران: باری ماددەیەکە کە گەردەکانی لەناو شلەیەکدا وەستابن بێ ئەوەی بتوێنەوە.
**suspension bridge,** پردی هەڵواسراو.
**suspension point,** خاڵی لابردن: سێ خاڵە کە نیشانەی لابردنی چەند وشەیەکن لە دەقی نووسینێکدا.
**suspensive** (sə-spen′siv), *adj.* (١) وەستێنەر؛ ڕاگر؛ ڕاگیرکەر.
(٢) دوودڵ؛ ڕاڕا.
**suspensor** (sə-spen′sẽr), *n.* = suspensory.
**suspensory** (sə-spen′sə-ri), *adj.* (١) ڕاگر، ڕاگیرکەر؛ پێبەست:
***( a ~ muscle or bandage)***
(٢) دواخەر؛ وەستێنەر (بڕیار)؛ ڕاوەستێن.
***n.*** ماسولکە؛ برینپێچ، یا شتی ڕاگیرکەر.
**suspicion** (sə-spish′ən), *n.* (١) گومان؛ بەدگومانی؛ دڵ پیسی.
(٢) نەخت؛ نەختاڵ؛ تۆز؛ تۆسقاڵ.
***v.t.*** [Dial or Colloq.], گومان لێکردن؛ بەدگومانی لێکردن؛ گومان لێ بوون.
**above suspicion,** گومانی لێ ناکرێ؛ پاك (مرۆڤ).
**on suspicion,** بەهۆی گومان لێکرانەوە؛ لەسەر گومان.
**under suspicion,** گومان لێکراو؛ گومانی لێ دەکرێ؛ بەدگومانی لەسەرە.
**suspicious** (sə-spish′əs), *adj.* (١) جێی گومانە؛ گومانی لێ دەکرێ؛ گومان لێکراو: ***( ~ behavior )*** .
(٢) بە گومان؛ گوماناوی؛ گومانکەر؛ دڵ پیس:
***( He has a ~ nature.; ~ of strangers )***
**suspiration** (sus′pi-rā′shən), *n.* هەناسەی سارد؛ هەناسەی پڕ ئاخ وداخ.
**suspire** (sə-spīr′), *v.i.* [Poetic], هەناسەی سارد هەڵکێشان.
**sustain** (sə-stān′), *v.t.* (١) درێژەپێدان؛ بەردەوام کردن:
***( to ~ an argument)***
(٢) پێویستی ژیان پێدان؛ یارمەتیدان.
(٣) دەوام پێدان؛ درێژەپێدان؛ ڕاگرتن: ***( Food ~s life.)*** .
(٤) بەرگەگرتن؛ ڕاگرتن (قورسایی)؛ هەڵگرتن:
***( Can this light shelf ~ the weight of all these books?)***
(٥) پاڵپشتی کردن؛ هاندان. (٦) دەربردن؛ هەڵکردن؛ خۆڕاگرتن.
(٧) چەشتن (ناخۆشی، ئازار)؛ نۆشین؛ تووش بوون:
***( He ~ed injuries in the accident.)***
(٨) پەسەندکردن؛ بە ڕەوا دانان: ***( The court ~ed her claim.)*** .
(٩) چەسپاندن؛ سەلماندن؛ ساغ کردنەوە.
**sustained** (sə-stānd′), *adj.* درێژخایەن؛ بەردەوام؛ یەك بین.
**sustaining program,** بەرنامەی ڕادیۆ یا تەلەفزیۆنی بێ بڵاونامەی بازرگانی.
**sustenance** (sus′ti-nəns), *n.* (١) (ا) هۆی گوزەران؛ هۆی ژیان.
(ب) گوزەران؛ ژیان. (٢) خواردەمەنی؛ خواردن؛ ئازووقە؛ بژێو.
(٣) (ا) پاڵپشتی کران؛ یارمەتی دران. (ب) پێویستی ژیان پێدران.
(٤) هۆ یا سەرچاوەی بەهێزی و پشتیوانی و یارمەتی و بەردەوامی.
**sustentation** (sus′ten-tā′shən), *n.* (١) پاراستن؛ هێشتنەوە؛ ڕاگیران؛ خایان؛ پاڵپشتی کران. (٢) پاڵپشت؛ کۆڵەکە.
**sustention** (sə-sten′shən), *n.* خایاندن؛ درێژەپێدان؛ دەوام پێدان.
**susurrant** (soo-sũr′ənt, syoo-sũr′ənt), *adj.* چرپەکەر؛ خشەخشکەر.
**susurrate** (soo-sũr′āt, syoo-sũr′āt), *v.i.* چرپەکردن.
**susurration** (sōō′sə-rā′shən, sū′sə-rā′shən), *n.* چرپە؛ خشپە.
**susurrous** (soo-sũr′əs, syoo-sũr′əs), *adj.* = susurrant.
**sutler** (sut′lẽr), *n.* چەرچی ئۆردوگا؛ دەستگێڕی سوپا؛ دووکانداری ئۆردوگا
**sutra** (sōō′trə), *n.* (١) (ا) پەند (ئایینی بوودی).
(ب) کۆمەڵە پەندێکی وەها. (٢) گفتوگۆکانی بوودا.
**sutta** (soot′ə), *n.* = sutra.
**suttee** (su-tē′, sut′ē), *n.* (١) بێوەژنێکی هیندییە کە خۆی فڕێ دەداتە ناو ئاگری مێردە مردووەکەیەوە و خۆی دەسووتێنێ.
(٢) ئەم جۆرە خۆسووتاندنە.
-**sutteeism** *(n.)*.
**suture** (sōō′chẽr, sū′chẽr), *n.* (١) دوورینەوە (برین).
(٢) شیرازە. (٣) (ا) لێکدانی دوو ئێسقان بەتایبەتی هی کەللەسەر.
(ب) هێڵی ئەم لێکدانە. (٤) (ا) هێڵی لێکدانی دوو بەشی ڕووەك.
(ب) هێڵی نێوانی لێواری دوو لەتی کەلوو یا میوە.
(٥) (ا) دەزووی برین دوورینەوە. (ب) برین دوورینەوە.
(ج) تەقەڵی ئەم برین دوورینەوە.
***v.t.*** دوورینەوە (برین).
**suzerain** (sōō′zə-rin, sū′zə-rān′), *n.* (١) دەرەبەگی گەورە؛ دەرەبەگ. (٢) وڵاتێکی دەسەڵاتدارە بەسەر وڵاتێکی لە خۆی بچووکتردا لە
**suzerainty** (sōō′zə-rin-ti, sū′zə-rān′ti), *n.* دەسەڵاتداری (وڵاتێك بەسەر وڵاتێکی لەخۆی بچووکترو بێ دەسەڵاتتردا)؛ ژووردەستی؛ دەسەڵات.
**svelte** (svelt), *n.* قەد باریك و جوان؛ باریکەلە؛ شۆخ و شەنگ؛ باڵا باریك.
**swab** (swäb), *n.* (١) زەمینەسڕ؛ گسکی ئیسفەنج یا پەڕۆ (بۆ سڕینی زەمینەی کەشتی و شوێنی تر). (٢) (ا) پارچەیەك لۆکە، پەڕۆ، یا ئیسفەنجە بە سەری دارکێکەوە بۆ دەرمان لێدان یا پاکردنەوەی ئەندامێکی لەش.
(ب) ئەو شتە پیسییەی وەها لە ئەندامێکی لەش لادەبرێ.
(٣) فڵچەی پاکردنەوەی لوولەی دەمانچە و تفەنگ.
(٤) [Slang]، کەسێکی گەلحۆی هیچ وپووچ.
***v.t.*** دەرمان لێدان یا پاکردنەوە بە پارچەیەك لۆکە، پەڕۆ یا ئیسفەنج.
**swabber** (swäb′ẽr), *n.* (١) بەکارهێنەری پارچە لۆکە یا ئیسفەنج بۆ دەرمان لێدان یا پاکردنەوەی ئەندامی لەش.
(٢) بەکارهێنەری گسکی ئیسفەنج یا پەڕۆ. (٣) کەسێکی گەلحۆی هیچ وپووچ.
**swaddle** (swäd′′l), *n.* مەلۆتکە پێچ.
***v.t.*** (١) مەلۆتکە پێچانەوە. (٢) پێچانەوە؛ بەستنەوە.
**swaddling clothes,** (١) پەڕۆی مەلۆتکە پێچانەوە.
(٢) بەرگی منداڵی ساوا. (٣) سەردەمی ساوایەتی.
(٤) چاودێری توند و تیژ (وەك هی منداڵ).
**swag** (swag), *v.i.* (١) لەنجەکردن؛ لارەولارکردن؛ لەنجەولارکردن.
(٢) داکەوتن؛ نەوین؛ داتەپین. (٣) گەڕان بە کەشکۆڵ یا توورەکەی شانەوە.
***n.*** (١) کەشکۆڵ؛ توورەکەی شان. (٢) لەنجە؛ لارەولار؛ لەنجەولار.
(٣) [Slang]، تالانی؛ ماڵی تالانی؛ شتومەکی دزراو.
**swage** (swāj), *n.* (١) قاڵبی ئاسنگەری.
(٢) ئامێری نوشتانەوە و ڕێك وپێك کردنی کانزا.
***v.t.*** ڕێك وپێك کردنی کانزا بە قاڵب و چەکوش و ئامێری تایبەتی.
**swage-block,** قاڵبی کون کوناوی پێچ پێچاوی ئاسنگەری.
**swagger** (swag′ẽr), *v.i.* (١) بە کەش وفشەوە ڕۆیشتن؛ پۆزلێدان؛ بە کەشخەوە ڕۆیشتن؛ خۆبادان. (٢) فشەکردن؛ خۆهەڵکێشان؛ خۆفشکردنەوە؛ لاف وگەزاف لێدان
***v.t.*** کارتێکردن بە فشە و لاف وگەزاف و خۆهەڵکێشان.
***n.*** (١) ڕۆیشتنی کەشخە یا کەش وفش؛ خۆبادان لە ڕۆیشتندا؛ پۆز
(٢) لاف وگەزاف؛ فشە؛ خۆهەڵکێشان.
-**swaggerer** *(n.)*; **swaggeringly** *(adv.)*.
**swagger stick,** داردەستی ئەفسەر.
**Swahili** (swä-hē′li), *n.* (١) سەواحیلی: یەکێکە لە دانیشتوانی گەلی "زنجبار" لە ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقا. (٢) زمانی سەواحیلی: زمانی بازرگانی و ڕەسمی گەلێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقایە.
**swain** (swān), *n.* [Poetic or Archaic], (١) لاوی لادێ؛ گەنجی لادێ؛ لادێیی. (٢) شوانی گەنجی دڵدار. (٣) دڵدار.

**swale** (swāl), ***n.*** زەلکاو؛ زۆنگاو؛ چالایی تەڕ.
**swallow** (swäl′ō), ***n.*** پەڕەسێلکە
**swallow** (swäl′ō), ***v.t.*** (١) قووتدان؛ هەڵ لووشین.
(٢) هەڵ لووشین (مەجاز)؛ ماشینەوە.
(٣) پاشگەزبوونەوە؛ کێشانەوە (ووتە)
(٤) قسە لێ خواردنەوە؛ لێ قوبوول کردن: ***( He had to ~ their insults.)*** .
(٥) بڕواپێکردن بێ پرسیار؛ گومان لێ نەکردن: ***( a hard story to ~ )*** .
(٦) پێ پەستکردن؛ شاردنەوە؛ دەرنەبڕین: ***( He had to ~ his pride.)*** .
***v.i.*** قووتدان
***n.*** (١) قووتدان (٢) قوم؛ ئەوەندەی بە یەك جار قووت دەدرێ.
(٣) قوڕگ؛ گەروو؛ سورێنچکە.
**swallow-tail** (swäl′ō-tāl′), ***n.*** (١) (ا) کلکی پەڕەسێلکە.
(ب) شتێکە کە لە کلکی پەڕەسێلکە بکات.
(٢) [Colloq.]: چاکەتی کلك پەڕەسێلکەیی.
(٣) پەپوولەی کلك پەڕەسێلکەیی.
**swallow-tailed** (swäl′ō-tāld′), ***adj.*** کلك پەڕەسێلکەیی، واتە دووفلیقانە
**swallow-tailed coat,** چاکەتی درێژی کلك پەڕەسێلکەیی، واتە دووفلیقانە
**swam** (swam), *past tense of* **swim.**
**swami** (swä′mi), ***n.*** *Also* **swamy.** سوامی: ڕابەر یا مامۆستای ئاینی هیندی
**swamp** (swämp, swômp), ***n.*** زەلکاو؛ زۆنگاو؛ گەناو؛ زۆنگ.
***adj.*** زەلکاوی؛ لە زەلکاودا دەژی؛ هی زۆنگاوە.
***v.t.*** (١) نوقوم کردن؛ کردن بەژێر ئاوەوە؛ داپۆشین بە ئاو.
(٢) کردن بە ژێر باری گران و دەردی سەرییەوە؛ پەرێشان کردن؛ بوون بەژێرەوە:
***( He was ~ed with work.; Heavy debts ~ed them.)***
(٣) نوقوم کردن بە پڕکردنی لە ئاو (بەلەم، کەشتی)
***v.i.*** نوقوم بوون؛ بوون بەژێر ئاوەوە؛ ژێرئاوکەوتن.
**swamper** (swämp′ēr, swômp′ēr), ***n.*** (١) دانیشتووی زەلکاو؛ زۆنگاوی؛ نیشتەجێی زۆنگاو. (٢) زەلکاو پاکەرەوە؛ دارستان پاکەرەوە یا هەڵپاچ. (٣) (ا) کرێکار؛ بەردەست (وەك لە چێشتخانەیەکدا).
(ب) سەکنی لۆری.
**swamp fever,** = **malaria.**
**swamp-land** (swämp′land′, swômp′land′), *n.* = **swamp.**
**swampy** (swäm′pi, swôm′pi), ***adj.*** (١) زەلکاوی؛ لە زەلکاو پێکهاتوو (٢) زەلکاوی؛ لە زەلکاو دەچێ.
**-swampiness *(n.).***
**swan** (swän, swôn), ***n.*** (١) قوو؛ باڵندەیەکی ئاوییە لە قاز دەچێ.
(٢) گۆرانی بێژی دەنگخۆش؛ هۆنەری لێهاتوو.
(٣) [S-]: کۆنەستێرەی قوو؛ ناوی کۆنەستێرەیەکە.
**swan dive,** قووە مەلە: جۆرە خۆ فڕێدانە ناو ئاوێکە بریتییە لە لاق و باڵ درێژکردنەوە بۆ دواوەو پشت چەماندنەوە بە دوادا.
**swang** (swaŋ), [Rare], *past tense of* **swing.**
**swanherd** (swän′hûrd′, swôn′hûrd′), ***n.*** شوانە قوو؛ قوو پەروەردەکەر.
**swank** (swaŋk), ***n.*** [Slang]. (١) خۆنوواندن؛ کەش و فش؛ کەشخە؛ خۆدەرخستن (٢) لاف و گەزاف؛ گەزاف لێدان؛ خۆهەڵکێشان.
***adj.*** [Slang], (١) خۆ زۆر دەرخەر یا نوێنەر (جل و بەرگ).
(٢) زیت؛ چالاك؛ بە کڵف و گوڕ.
***v.i.*** [Slang], خۆنوواندن؛ خۆبادان؛ خۆفشکردنەوە؛ خۆهەڵکێشان.
**-swankily *(adv.)*; swankiness *(n.)*; swanky *(adj.).***
**swannery** (swän′ēr-i, swôn′ēr-i), ***n.*** پەروەردگەی قوو؛ جێی قوو پەروەردەکردن.

**swan's-down** (swänz′doun′), ***n. Also* swansdown,** (١) وردە پەڕی قوو؛ نەرمە پەڕی قوو. (٢) قوماشێکی خوری یا لۆکەی نەرمی ئەستووری تووکنە (جل و بەرگی منداڵی ساوای لێ درووست دەکرێ).
**swan-skin** (swän′skin′), ***n.*** (١) پێستە قوو (بە پەڕەکەیەوە).
(٢) جۆرە قوماشێکی خوری یا لۆکەیە.
**swan song,** (١) خوێندنی قوو: دوا خوێندنی قووە پێش مردنی (ئەفسانە).
(٢) دوا بەرهەم یا کاری کەسێکە پێش مردن یا خانەنشینی.
**swap** (swäp, swôp), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.], ئاڵوگۆڕکردن؛ گۆڕینەوە.
***n.*** [Colloq.], ئاڵوگۆڕکاری؛ گۆڕینەوە؛ ئاڵوگۆڕی.
**sward** (swôrd), ***n.*** مێرگ؛ چیمەن؛ زەوی گیا داپۆشیو.
**sware** (swâr), *archaic past tense of* **swear.**
**swarm** (swôrm), ***n.*** (١) پوورە؛ پوورە هەنگ.
(٢) پوورە هەنگێکە کە پوورە کۆنەکە جێ دەهێڵن بۆ یەکێکی تازە.
(٣) گەلە؛ پۆل؛ کۆمەڵە؛ ژمارەیەکی زۆر. (٤) کۆمەڵە جانەوەر.
(٥) کۆمەڵە خەڵك؛ جەماوەر؛ جەماوەری ووروژاو.
***v.i.*** (١) فڕین بە کۆمەڵ (پوورە هەنگ)؛ پوورەدان.
(٢) تێ ووروژان؛ تێ مرۆکان؛ تێ وورووکان؛ پێوە نیشتنەوە؛ خوروشان
(٣) جمەماتن؛ تێچڕان؛ زۆر پڕبوون لە.
***v.t.*** تێ ووروژاندن؛ تێچڕاندن؛ تێ جماندن؛ پڕکردن.
**-swarmer *(n.).***
**swart** (swôrt), ***adj.*** [Dial. or Poetic], = **swarthy.**
**swarth** (swôrth), ***n.*** [Dial.], = **sward.**
***adj.*** = **swarthy.**
**swarthy** (swôr′*th*i, swôr′thi), ***adj.*** ڕەشکەلە؛ ڕەشباو؛ دێز؛ ڕەشتاڵە.
**-swarthily *(adv.)*; swarthiness *(n.).***
**swash** (swäsh, swôsh), ***v.i.*** (١) شلپە لێوەهاتن؛ پیامالین و دەنگی شلپە لێوەهاتن. (٢) بە کەش و فشەوە ڕۆیشتن؛ خۆبادان؛ بە فیزەوە ڕۆیشتن.
***v.t.*** شلپە لێ هەڵسانن؛ شلپەشلپ پێ کردن؛ دەنگی وەك ئاو لە دەم وەردان لێوەهێنان.
***n.*** (١) جۆگە ئاوێکی خوڕە لە پشت بەستوە لمێکەوە نزیك کەنار دەریا.
(٢) بەستووی شەپۆل بەسەردا شکاوە.
(٣) شلپەی ئاو؛ شلپەشلپی شەپۆلە ئاو.
(٤) خۆ بادان؛ بە فیزەوە ڕۆیشتن؛ بە کەش و فشەوە ڕۆیشتن.
**swashbuckle** (swäsh′buk′′l, swôsh′buk′′l), ***v.i.*** خۆبادان؛ فشەفش کردن؛ خۆهەڵکێشان؛ گەزاف لێدان.
**swashbuckler** (swäsh′buk′lēr, swôsh′buk′lēr), ***n.*** فس- فس پاڵەوان؛ کەسێکی خۆبادەر یا خۆهەڵکێش؛ کەسێکی فشەچی یا بە کەش و فش؛ گەزاف لێدەر.
**swashbuckling** (swäsh′buk′liŋ), ***adj.*** فشەچی؛ گەزاف لێدەر؛ خۆبادەر؛ خۆهەڵکێش.
***n.*** فشەکردن؛ گەزاف لێدان؛ خۆبادان؛ خۆهەڵکێشان.
**swasher** (swäsh′ēr, swôsh′ēr), ***n.*** = **swashbuckler.**
**swash letters,** تیپی گەورەی لاری کلکدار.
**swastika, swastica** (swäs′ti-kə), ***n.*** (١) نیشانەی خاچی چەماوە (کە نیشانەی هیندییە ئەمەریکییەکان و هەندێ لە گەلانی هیندستان و یابانە). (٢) نیشانەی حیزبی نازی ئەڵمانی.
**swat** (swät), ***v.t.*** پیامالین؛ پیاکێشان؛لێدان؛ زرمە لێ هەڵسان.
***n.*** پیامالینێکی لەپڕ؛ پیاکێشان یا زرمە لێ هەڵسانێکی لەپڕ.
**swatch** (swäch), ***n.*** نموونە قوماش؛ نموونە.
**swath** (swäth, swô*th*), ***n.*** (١) ئەو جێگەیەی بە یەك قول بە داس دەدوورێتەوە. (٢) [Rare]، یەك لێدانی داس لە ماکۆداندا.
(٣) ڕیزە گیا یا گەنمی دووراوە بە داس یا مەکینەی چیمەن بڕین.

(٤) ریز؛ هێڵ.
**cut a wide swath,** خۆدەرخستن؛ سەرنج ڕاکێشان؛ خۆنوواندن.
**swathe** (swā*th*), *v.t.* (١) پێچانەوە؛ پێچانەوە بە سارغی.
(٢) پێبەست یا سارغی تێوەپێچان. (٣) دەورەدان؛ دەورگرتن.
*n.* پێبەست؛ سارغی.
**swatter** (swät′ēr, swôt′ēr), *n.* (١) لێدەر؛ پیاکێشەر؛ ئەو کەسەی
کە پیادەماڵێت. (٢) مێش کوژ. (هەروەها " fly swatter ").
**sway** (swā), *v.i.* (١) لارەولارکردن؛ لەنجەولارکردن؛ شەکینەوە؛
شەکانەوە: *( The branches of the tree ~ed in the wind.)*.
(٢) لەتردان؛ کەوتن بە لایەکدا؛ لاربوونەوە بە لایەکدا.
(٣) لایەنگری کردن؛ ڕا لەگەڵ لایەك بوون. (٤) دەسەڵات بەسەردا بوون.
*v.t.* (١) لارەولارپێکردن؛ شەکاندنەوە؛ لەراندنەوە؛ لەنجەولارپێکردن.
(٢) خستن بە لایەکدا؛ لارکردنەوە.
(٣) کارتێکردن؛ ڕا ڕاکێشان؛ ڕا پێ گۆڕین:
*( His speech ~ed thousands of votes.;*
*His threats will not ~ us.)*
(٤) [Archaic]، (ا) گوریزی دەسەڵات بەکارهێنان.
(ب) دەسەڵات بەسەردابوون؛ جڵەوگرتن؛ خستنە ژێر ڕکێفەوە.
(٥) ( ~ up )، بەرزکردنەوەی دارکەشتی.
*n.* (١) لەنجەولار؛ لارەولار؛ شەکانەوە. (٢) هێز؛ کارتێکران؛ کار؛ تەووژم.
(٣) مەیل (ڕا)؛ لایەنگیری.
(٤) دەسەڵات؛ جڵەو؛ ڕکێف:
*( The country is under the ~ of a dictator.)*
**hold sway over,** دەسەڵات بەسەردابوون؛ دەست بەسەردا ڕۆیشتن؛
جڵەو بەدەستەوەبوون
**sway-back** (swā′bak′), *n.* پشت پسانی وولاخ (بەهۆی باری
قورسەوە)
**sway-backed** (swā′bakt′), *adj.* پشت پساو (بەهۆی باری قورس).
**swear** (swâr), *v.i.* (١) سوێند خواردن.
(٢) بەڵێندان؛ گفتدان؛ سوێند خواردن. (٣) جوێندان؛ جنێودان.
(٤) گەواهیدان پاش سوێند خواردن (دادگا).
*v.t.* (١) سوێند خواردن. (٢) بەڵێندان؛ گفتدان؛ سوێند خواردن.
(٣) سوێند خواردن.
**swear at,** جوێن پێدان؛ جنێو پێدان.
**swear by,** (١) سوێند خواردن بە سەری کەسێك یا شتێکی پیرۆز.
(٢) بڕوا زۆر پێ بوون.
**swear in,** سوێنددان؛ سوێندخواردن:
*( The new minister was sworn in yesterday.)*
**swear off,** بەڵێندان بە وازلێهێنان یا دەست لێ بەردار بوون.
**swear-word** (swâr′wûrd′), *n.* جوێن؛ جنێو.
**sweat** (swet), *v.i.* (١) ئارەق کردن؛ ئارەق کردنەوە؛ ئارەق دەردان.
(٢) ئارەق کردنەوە (گەڵا تووتن)؛ یەق کردنەوە؛ ترشان. (٣) دەڵاندن.
(٤) [Colloq.]، ڕەنج دان؛ ئارەق ڕشتن؛ ماندووبوون.
*v.t.* (١) ئارەق کردن؛ ئارەق کردنەوە؛ ئارەق دەردان. (٢) ئارەق پێ کردن.
(٣) یەق پێ کردنەوە: *( The tobacco leaves are being ~ed.)*.
(٤) ئارەقاوی کردن؛ بە ئارەق تەڕکردن.
(٥) ( ~ out )، خۆ لێ ڕزگارکردن یا چاکبوونەوە بە ئارەق کردنەوە:
*( He is ~ing out his cold, flu, etc.)*
(٦) کانزا گەرم کردن و بەشێك لێ دەرهێنان. (٧) لەحیم کردن.
(٨) ئیش زۆر پێ کردن؛ ئارەق زۆر پێ ڕشتن؛ ڕەنج زۆر پێدان؛ ڕەتاندن؛
زۆر ماندووکردن. (٩) چەوساندنەوەی کرێکار بە ئیشی زۆر و کرێی کەم.
(١٠) لێکردنەوەی بەشێك لە پارە بە لێکخستن.
(١١) قسە لێ دەرهێنانی دیل و گومانبار بە ئازاردان و چەوساندنەوە.
*n.* (١) ئارەق. (٢) دڵۆپی ئارەق. (٣) یەق کردنەوە.
(٤) دڵەڕاوکێ (کە دەبێتەهۆی ئارەق کردنەوە)؛ بێ ئارامی؛ بە پەرۆشی.
(٥) ڕەنج؛ ئارەق ڕشتن؛ ئارەقی ئاوچەوان؛ ماندوویێتی؛ ڕەتاندن.
**sweat blood,** (١) زۆر ڕەنج دان؛ ئارەق ڕشتن؛ زۆر هەوڵدان.
(٢) لە دڵەڕاوکێدا بوون؛ بە پەرۆش بوون؛ بێ ئارام بوون.
**sweat (something) out,** [Slang], (١) چاوەڕێ کردن (لە ڕیزێکدا
یا بۆ شتێك). (٢) بە تەمای شتێك بوون بە دڵەڕاوکێوە؛ بە بێ ئارامی چاوەڕێ
کردن.
**sweatband** (swet′band′), *n.* (١) شریتی ئارەق: پارچەیەك قوماش
یا چەرمە دەکرێ بە بەری کڵاو بۆ ئارەق هەڵچنین.
(٢) سەرپێچ: پارچەیەك قوماشە بە ئاوچەوانەوە دەپێچرێتەوە بۆ ئارەق هەڵچنین.
**sweat-box** (swet′boks′), *n.* (١) سنووقی یەق کردنەوەی پێستە؛
جێی میوە ترشاندن. (٢) (ا) ژووری لێپرسینەوە.
(ب) ژووری ئازاردان لە بەندیخانەدا.
**sweater** (swet′ēr), *n.* (١) زۆر ئارەقکەر. (٢) دەرمانی ئارەق پێکەر.
(٣) بلووز؛ فانیلەی ئەستووری سەرەوە.
(٤) خاوەن ئیشێکە کە کرێکارەکانی زۆر ئیش پێ دەکات بە کرێیەکی کەم.
**sweat gland,** ئارەق ڕژێن؛ ئارەقە لوو.
**sweat shirt,** بلووسی تەنکی لۆکەی ئارەق هەڵچن (بۆ وەرزش لەبەر
دەکرێ بەتایبەتی)
**sweat shop** (swet′shop′), *n.* کارگەی ئارەق ڕشتن: کارخانەیەکە کە
کرێکارەکانی زۆریان ئیش پێ دەکرێ بە کرێیەکی کەم.
**sweat suit,** دەستێك پانتۆڵ و بلووزی لۆکەیە بۆ وەرزش.
**sweaty** (swet′i), *adj.* (١) ئارەقاوی؛ ئارەق کردوو.
(٢) ئارەقی؛ لە ئارەق دەچێ: *( a ~ odor )*.
(٣) ئارەق پێکەر
(٤) گران؛ قورس: ماندووکەر: *( ~ work )*.
-**sweatily** *(adv.)*; **sweatiness** *(n.)*.
**swede** (swēd), *n.* = **rutabaga.**
**Swede** (swēd), *n.* سویدی؛ هاووڵاتی سویدی.
**Swedish** (swē′dish), *adj.* سویدی (وڵات، گەل، زمان... هتد).
*n.* سویدی؛ زمانی سویدی.
**Swedish massage,** شێلانی سویدی.
**Swedish movements,** جووڵانەوەی سویدی؛ وەرزشی سویدی.
**Swedish turnip,** = **rutabaga.**
**sweeny** (swē′ni), *n.* ووشکبوونی ماسولکەی شانی ئەسپ.
**sweep** (swēp), *v.t.* (١) گسك لێدان؛ماڵین.
(٢) بە ئاستەم پیاهێنان یا پیاخشاندن:
*( Her dress swept the ground.)*
(٣) (ا) بە پەلە پیا ڕۆیشتن؛ هەمووگرتنەوە؛ پیا هاتن‌وچوون:
*( Armed bands ~ the countryside.)*
(ب) پیاخشان بە پەلە: *( His eyes swept the room.)*.
(٤) (ا) ڕاماڵین؛ ڕادان؛ ڕاماڵ دان.
(ب) ڕاماڵین (مەجاز)؛ خۆ لەبیربردنەوە:
*( Love swept him off his feet.)*
(٥) جۆماڵ کردن؛ ڕاماڵینی بنی ڕووبار.
(٦) (ا) هەموو یارییەکان بردنەوە؛ هەموو خەڵاتەکان بردنەوە
(ب) زۆر بە باشی بردنەوە؛ هەموو بردنەوە:
*( The Democrats swept the election.)*
*v.i.* (١) گسك لێدان؛ ماڵین.
(٢) پێدا ڕۆیشتن بە هێمنی و جوانی؛ پێدا خشان:
*( The planes ~ across the sky.;*
*Her fingers swept over the string.)*
(٣) بەسەر زەویدا خشان بە دوای خۆدا (کراسی درێژ).
(٤) درێژبوونەوە بە جوانی.
*n.* (١) گسکدان؛ ماڵین. (٢) وەشاندن (تەور، تەوراس... هتد)؛
دەست داهێنانەوە پەیتاپەیتا و بە ڕێك و پێکی: *( the ~ of a scythe)*.

(٣) بەسەر زەویدا خشان (کراسی درێژ).
(٤) مەودا: *( They came within the ~ of our guns.)*.
(٥) پانتایی: *( a long ~ of meadow)*.
(٦) هێڵ: پێچ
(٧) گسکدەر: *( a chimney ~ )*.
(٨) (*pl.*)، خۆڵو زبڵی گسکدراو.
(٩) هەموو بردنەوە؛ بردنەوەی تەواو.
(١٠) سەوڵی درێژ. (١١) **sweepstakes**.

**sweeper** (swēp′ẽr), *n.* (١) گسکدەر (٢) گسك.

**sweeping** (swēp′iŋ), *adj.* (١) گسکدەر؛ پاککەرەوە. (٢) بڵاو.
(٣) گشتی؛ گشتگرەوە:
*( ~ changes; ~ generalizations; a ~ statement )*
(٤) تەواو *( a ~ victory )*.
*n.* (١) (*pl.*)، خۆڵو زبڵی گسکدراو (٢) گسکدان؛ماڵین.

**sweepstakes** (swēp′stāks´), *n. Also* **sweepstake,** (١) پیانقۆ؛ هایبەخت (٢) پێشبڕکێیەکە، بەتایبەتی غارغارێنی ئەسپ، بۆئەوەی بزانرێ کێ پیانقۆکە دەباتەوە. (٣) خەڵاتی ئەم جۆرە پیانتقۆیە.

**sweet** (swēt), *adj.* (١) شیرین.
(٢) (ا) خۆش (تام، دەنك، بۆن، ڕووخسار... هتد).
(ب) خۆش (قسە)؛ ساز: *( ~ praise )*.
(ج) ناسك (ڕەووشت)؛ ڕووخۆش؛ دەم بە پێکەنین: *( a ~ girl )*.
(د) [Slang]. باش؛ چاك؛ پەسەند.
(٣) سار (ئاو): *( ~ water )*.
(٤) تازە؛ بۆگەن نەکردوو. (٥) بۆ کشتوکاڵ باشە (خاك).
(٦) ترش‌وگۆگردی تێدا نییە (کیمیا). (٧) ساز (مۆسیقای جان).
*n.* (١) شیرینی؛ شیرینێتی
(٢) (*pl.*). حەلوا؛ شیرینی؛ خواردەمەنی شیرین.
(٣) (*pl.*) خۆشی؛ بەسەرهاتێکی خۆش. (٤) [Colloq.]، پەتاتەی شیرین.
(٥) یار؛ دڵدار؛ دەنك؛ کەسێکی زۆر خۆشەویست
*adv.* بەخۆشی (ڕەفتار)؛ بە جوانیو ناسکی.
**-sweetly** ***(adv.).***
**be sweet on,** حەزلێکردن (دڵداری)؛ خۆشویستن؛ دڵ پێوەبوون.

**sweet alyssum,** ڕووەکێکی گوڵ سپی بۆنخۆشە.

**sweet-and-sour,** ترشو شیرین.

**sweet basil,** ڕێحانە.

**sweet bay,** جۆرێکە لە درەختی دەفنە.

**sweet-brier, sweet-briar** (swēt′brī´ẽr), *n.* گوڵەباخێکی خۆهەڵواسی گەڵا بۆن خۆشی قەد دڕکاوییە.

**sweet clover,** سێپەڕە: گیایەکی دەشتەکی گەڵا سێ پەلکەییە گوڵەکەی ڕەنگاوڕەنگو بۆن خۆشو شیرینە.

**sweet corn,** گەنمەشامی شیرین.

**sweeten** (swē′t'n), *v.t.* (١) شیرین کردن؛ شەکر تێکردن.
(٢) خۆش کردن؛ جوانو ڕێكوپێك کردن. (٣) هێمن کردنەوە؛ دڵنەوایی کردن.
(٤) لە بەرچاو شیرین کردن (سەوداگەری).

**sweetening** (swē′t'n-iŋ, swēt′niŋ), *n.* (١) شیرین کردن.
(٢) شتی شیرینکەر؛ شیرینکەر.

**sweet flag,** ڕووەکێکی زەلکاوی گەڵا تیژو باریكو درێژە ڕەگەکەی دەخورێت

**sweetheart** (swēt′härt´), *n.* (١) یار؛ دڵدار؛ دەنك.
(٢) کەسێکی باشو ناسكو ڕووخۆشو دڵ فراوان.

**sweetie** (swē′ti), *n.* [Colloq.], = **sweetheart.**

**sweetie-pie** (swē′ti-pī´), *n.* [Colloq.], = **sweetheart.**

**sweeting** (swē′tiŋ), *n.* (١) جۆرێکە لە سێوی شیرین.
(٢) [Archaic]، **sweetheart**.

**sweetish** (swē′tish), *adj.* (١) نەختێك شیرین. (٢) زۆر شیرین.
**-sweetishly** ***(adv.)***; **sweetishness** ***(n.).***

**sweet marjoram** = **marjoram.**

**sweetmeat** (swēt′mēt´), *n.* شیرینی؛ ماجوومی؛ حەلوا؛ جۆرێکە لە شیرینی.

**sweetness** (swēt′nis), *n.* (١) شیرینی؛ شیرینێتی.
(٢) ناسکیو ڕووخۆشیو لەسەرخۆیی.

**sweet oil,** ڕۆن زەیتوون

**sweet pea,** ڕووەکێکی خۆهەڵواسی گوڵ ڕەنگاوڕەنگی بۆن خۆشە لە توخمی پۆلکەیە.

**sweet potato,** پەتاتەی شیرین.

**sweet-shop** (swēt′shop´), *n.* دووکانی شیرینی؛ دووکانی حەلوا.

**sweet-talk** (swēt′tôk´), *v.t. & v.i.* مەرایی کردن؛ زمان لووسی کردن.
*n.* مەرایی؛ زمان لووسی.

**sweet tooth,** زۆر حەز لە شیرینی کردن.

**sweet william,** حوسنی یوسف؛ جۆرە گوڵێکە؛ جۆرێکە لە مێخەك.

**swell** (swel), *v.i.* (١) ئاوسان؛ هەڵئاوسان؛ هەوکردن؛ باکردن؛ هەڵتۆقین.
(٢) هەڵسان (شەپۆل، ئاو)؛ بەرزبوونەوە.
(٣) پڕبوون لە (شانازی، تووڕەیی، خۆ بە زل زانی)؛ فش بوونەوە
(٤) زیادبوون (هەست): *( Anger ~ed in him.)*.
(٥) زۆربوون (ژمارە، قەوارە، هێز)؛ زیادبوون:
*( Our ranks ~ed to over a thousand.)*
(٦) بەرزبوونەوە (دەنگ).
*v.t.* (١) (ا) ئاوساندن؛ هەڵئاوساندن؛ هەوپێکردن؛ فووتێکردن؛ هەڵتۆقاندن.
(ب) زیادکردن (ڕادە، پلە، ژمارە، قەبارە... هتد).
(ج) فشکردنەوە؛ پڕکردن لە (شانازی، تووڕەیی)؛ هەڵدان.
(د) زیادکردن (دەنگ)؛ زل کردن.
*n.* (١) (ا) هەڵئاوساوی؛ ئاوساوی؛ بلۆق؛ تلۆق.
(ب) شەپۆلی هەڵساو پێش شکانەوەی. (ج) گردی خڕ.
(٢) ئاوسان؛ هەڵئاوسان؛ هەوکردن.
(٣) زیادبوون (قەبارە، پلە، ژمارە، ڕادە)؛ زۆربوون.
(٤) [Colloq.]، کەسێکی تەڕپۆش؛ کەسێکی زۆر ڕێكوپێك لە جلوبەرگیدا
(٥) (ا) وردە وردە بەرزبوونەوەی دەنگی ئاوازی مۆسیقاو نزم بوونەوەی.
(ب) ئامێری بەرزو نزم کردنەوەی دەنگی ئامێری مۆسیقای وەك ئۆرگەن.
*adj.* (١) تەڕپۆش؛ زۆر ڕێكوپێك لە جلوبەرگدا.
(٢) [Slang]، نایاب؛ زۆر چاك؛ زۆرباش: *( a ~ girl, guy, etc.)*.

**swelled head,** [Colloq.], زۆر لەخۆبایی بوون؛ خۆ زۆر بە زل زانین؛ فیز؛ کەشوفش.

**swell-fish** (swel′fish´), *n.* جۆرە ماسییەکە فوو دەکاتە خۆی.

**swelling** (swel′iŋ), *n.* (١) ئاوسان؛ هەڵئاوسان؛ هەوکردن.
(٢) ئاوساوی؛ هەڵئاوساوی؛ ئەندامێکی هەوکردوو.
*adj.* ئاوساو؛ هەڵئاوساو؛ هەوکردوو.

**swelter** (swel′tẽr), *v.i.* لە گەرمادا پیشان؛ گەرمابردن؛ زۆر گەرمابوونو ئارەق کردنەوە.
*v.t.* (١) پیشاندن لە گەرمادا؛ ئارەق زۆر پێ کردن لە گەرمادا.
(٢) [Archaic]، دەردان (ژەهر)؛ لێ هاتنەدەرەوە.
*n.* (١) پیشان لە گەرمادا؛ زۆر گەرمابوون؛ گەرمابردن.
(٢) گەرمای ئێجگار زۆرو ناخۆش.

**sweltering** (swel′tẽr-iŋ), *adj.* (١) زۆر گەرمو ناخۆش.
(٢) گەرمابردوو؛ زۆر ئارەق کردووو پیشاو لە گەرمادا.

**sweltry** (swel′tri), *adj.* = **sweltering.**

**swept** (swept), *past tense and past participle of* **sweep.**

**swerve** (swũrv), *v.i.* لە ڕێ لادان؛ لادان بە لایەکدا؛ پێچکردنەوە:
*( The driver ~d to the right.)*
*v.t.* لە ڕێ لادان؛ پێچ پێکردنەوە.

**n.** (١) لادان بە لایەکدا؛ پێچکردنەوە. (٢) شتی لادەر یا پێچکەرەوە.

**swift** (swift), ***adj.*** (١) خێرا؛ تیژڕەو؛ تیژ (ڕۆیشتن).
(٢) گورج؛ دوا نەخراو؛ یەکسەر؛ خێرا (ڕوودان):
***( a ~ retort, reply, punishment, etc.)***

***adv.*** خێرا؛ بە خێرایی؛ بە گورجی.

***n.*** (١) خولخولۆکە؛ بەکرە.
(٢) پەڕەسێلکەی کێوی؛ باڵندەیەکە لە توخمی پەڕەسێلکە.
(٣) جۆرە مارمێلکەیەکی خێرایە.

**-swiftly *(adv.)*; swiftness *(n.)*.**

**swig** (swig), ***v.t. & v.i.*** [Colloq.], هەڵقوڕاندن بە پەلە؛ هەڵ لووشین؛ بە قومی زل خواردنەوە؛ ماشینەوە.

***n.*** [Colloq.], قومی زل (بەتایبەتی مەی).

**-swigger *(n.)*.**

**swill** (swil), ***v.t.*** (١) زۆر خواردنەوە بە پەلەو بە قومی زل زل؛ ماشینەوە؛ هەڵ لووشین (٢) ئاوی زۆر تێوەردان؛ شۆردن بە ئاوی زۆر.
(٣) بەرماوە دان بە گیانەوەر (بەتایبەتی بەرازی ماڵی).

***v.i.*** هەڵ لووشین (مەی)؛ زۆر خواردنەوە بە پەلەو بە قومی زل زل.

***n.*** (١) بەرماوەی دراو بە بەرازی ماڵی و زیندەوەری تر.
(٢) بەرماوە؛ زبڵ. (٣) قومێکی زل لە مەی.

**swim** (swim), ***v.i.*** (١) مەلەکردن.
(٢) خشکان؛ خلیسکان؛ وەك مەلەکردن پێدا ڕۆیشتن.
(٣) سەرئاوکەوتن. (٤) بە ئاو داپۆشران.
(٥) پڕبوون لە ***( eyes ~ming with tears )*** .

***v.t.*** (١) بە مەلە بڕین؛ بە مەلە پێدا ڕۆیشتن: ***( to ~ a river)*** .
(٢) بە زۆر مەلەپێکردن.

***n.*** (١) مەلە؛ مەلەکردن. (٢) ماوەی مەلەکردن. (٣) دووری مەلەکردن.

**in the swim,** ئاگاداری باوی کۆمەڵ (جل‌وبەرگ، ڕای خەڵك، ژیانی کۆمەڵایەتی... هتد)

**swim** (swim), ***n.*** سەرەخوڵ؛ سەرەسووڕی؛ گێژی؛ وڕی:
***( Her head was in a ~ .)***

***v.i.*** (١) سەر گێژبوون؛ گێژبوون؛ تووشی سەرەخوڵ بوون.
(٢) خولانەوە یا سووڕخواردن لەبەرچاو:
***( The room swam before her eyes.)***

**swimmer** (swim′ēr), ***n.*** مەلەوان؛ ئاوباز؛ مەلەکەر.

**swimmeret** (swim′ēr-et´), ***n.*** لاقی مەلەی زیندەوەری قاقلەدار.

**swimming** (swim′iŋ), ***n.*** مەلە؛ مەلەکردن؛ ئاوبازی.

***adj.*** (١) مەلەکەر؛ مەلەکار. (٢) مەلەیی؛ بۆ مەلە بەکارهاتوو؛ هی مەلە.
(٣) پڕ لە ئاو یا فرمێسك: ***( ~ eyes )*** .

**swimming** (swim′iŋ), ***n.*** گێژی؛ وڕی؛ سەرەخوڵ.

***adj.*** گێژ؛ شت لەبەرچاو خولاوە

**swimming bladder,** هەوادانی ماسی؛ کیسەی هەوای ماسی.

**swimming hole,** گۆمی ناو ڕووبار.

**swimmingly** (swim′iŋ-li), ***adv.*** زۆر بە باشی و سەرکەوتوویی و ئاسانی.

**swimming pool,** گۆمی مەلە

**swimsuit** (swim′sūt´), ***n.*** جلی مەلە؛ مایۆ؛ بەرگی مەلە.

**swindle** (swin′d'l), ***v.t.*** دەسبڕین؛ هەڵخەڵەتاندن و پارە لێ کێشانەوە؛ پارە لێ کێشانەوە بە فێڵ؛ فێڵ لێکردن؛ فریودان (بۆ پارە لێ کێشانەوە)؛ چاوبەستکردن؛ لەخشتەبردن؛ گزی کردن.

***n.*** دەسبڕین؛ خەڵەتاندن و پارە لێ کێشانەوە؛ جامباز؛ گزیکەر.

**swindler** (swin′dlēr), ***n.*** دەسبڕ؛ فریوباز (بۆ پارە لێ کێشەرەوە)؛ جامباز.

**swine** (swīn), ***n.*** (١) *(pl.)*. بەراز؛ مالۆس؛ خووگ.
(٢) کەسێکی بۆگەن و بێ نرخ و بەدو چاوبرسی

**swine-herd** (swīn′hŭrd´), ***n.*** شوانە بەراز؛ بەراز پەروەردەکەر.

**swine-pox,** [Archaic], ئاولەی بەراز.

**swing** (swiŋ), ***v.i.*** (١) ئەمبەرو ئەوبەر کردن؛ لەرینەوە؛ هاتن‌وچوون وەك جۆلانێ؛ ئەملاو ئەولا کردن؛ لەنجەکردن.
(٢) دەست و لاق ڕاوەشاندن لە ڕۆیشتندا.
(٣) خولانەوە بە دەوری تەوەرەیەکدا؛ سووڕخواردن؛ سووڕانەوە:
***( The door swung open.)***
(٤) هەڵواسران (تاوانبار)؛ بە پەتەوە کران.
(٥) جۆلانێ کردن؛ دیلانێ کردن.
(٦) [Slang]، ڕابواردن (بەتایبەتی بە شێوەیەکی بەرەڵایی لە جووت بووندا)؛ سووڕدان؛ سەماکردن.

***v.t.*** (١) (ا) وەشاندن (تەور، تەوراس، شیر)؛ ڕاوەشاندن.
(ب) پیادان؛ بەرزکردنەوەو خستنەسەر:
***( He swung the bag onto his back.)***
(٢) جۆلانێ پێ کردن؛ دیلانێ پێ کردن؛ هاتووچۆ پێ کردن وەك جۆلانێ.
(٣) خولاندنەوە بە دەوری تەوەرێکدا؛ سووڕاندنەوە:
***( He swung the door open.)***
(٤) هەڵواسین بە جۆرێك کە بە ئاسانی هاتوچۆ بکات وەك جۆلانێ.
(٥) مەبەست بەجێهێنان؛ بە ئەنجام هێنان؛ کردن؛ سەرکەوتوو بوون تێدا:
***( I think we can ~ the election.)***
(٦) مۆسیقا لێدان لەسەر شێوازی "سوینگ" (کە جۆرێکە لە "جاز").

***n.*** (١) ئەمبەرو ئەوبەر کردن؛ لەرانەوە؛ هاتن و چوونی وەك جۆلانێ.
(٢) مەودای ئەم هاتن‌وچوونە یا ئەمبەرو ئەوبەر کردنە.
(٣) جۆری وەشاندن یا داهێنانەوە (گورزی گۆلف و بەیسبۆڵ).
(٤) خول؛ سووڕ؛ با پێدانێك.
(٥) پیامالینێك؛ مستەکۆڵە؛ شەپلاخ.
(٦) سەربەستی کردنی کارێك بە هەوەسی خۆ:
***( He gave us full ~ in the matter.)***
(٧) ڕاوەشانی دەست و قاچ لە ڕۆیشتندا.
(٨) ڕێڕەوی کارێك یا مەسەلەیەك. (٩) گوڕژم.
(١٠) کێشی مۆسیقاو هەڵبەست. (١١) جۆلانێ؛ دیلانێ؛ جۆلانە.
(١٢) (ا) مۆسیقای جاز یا "سوینگ". (ب) کێشی ئەم مۆسیقایە.
(١٣) [Colloq.]، بەرزو نزمی نرخی بازاڕ.

***adj.*** (١) تایبەتی بە مۆسیقای "سوینگ".
(٢) ڕاڕا؛ دوودڵ؛ بێ بار؛ هەمیشە گۆڕاو لەملاوە بۆ ئەولا:
***( The ~ vote will decide the outcome of the election.)***

**-swingable *(adj.)*.**

**in full swing,** بە تەواوی لە گەڕدایە؛ بە تەواوی و باشی کار دەکات؛ لەوپەڕی جم‌وجووڵ یا ئیش کردندایە:
***( Oil production is in full swing.)***

**swing bridge,** پردی جووڵاوە؛ پردێکە دەکرێتەوە بە لایەکدا بۆ تێپەڕبوونی کەشتی گەورە.

**swinge** (swinj), ***v.t.*** [Archaic], لێدان؛ بیرازکردن؛ قامچی لێدان.

**swingeing** (swin′jin), ***adj.*** [Colloq.], (١) زۆر زل؛ زۆر گەورە.
(٢) نایاب؛ زۆر باش.

**swinging door,** دەرگای خولاوە: دەرگایەکە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە بۆ کردنەوەو داخستنی.

**swinger** (swin′jēr), ***n.*** [Slang], (١) کەسێکە کە شوێن مۆدەو باوی ڕۆژگار دەکەوێت؛ کەسێکە کە هەمیشە بەدوای ڕابواردندا دەگەڕێت.
(٢) کەسێکی بەرەڵا (جووت بوون)؛ کەسێکی داوێن پیس.

**swingle** (swiŋ′g'l), ***n.*** داری کەتان و پەموو پاککردنەوە.

**swingle-tree** (swiŋ′g'l-trē´), ***n.*** = **whiffletree.**

**swing shift,** [Colloq.], نۆبە یا شەفتی بەینی بەیانیان و شەو لە کارگەیەکدا، واتە هی ئێواران لە کاتژمێری چوارەوە بۆ نیوەشەو.

**swinish** (swīn′ish), ***adj.*** بەرازی؛ پیس؛ بۆگەن؛ چاوبرسی؛ جانەوەری.

**swink** (swiŋk), ***v.i.*** [Archaic], ڕەنج دان؛ ئارەق ڕشتن؛

ئەركی گران بنێن

*n.* [Archaic], ڕەنج؛ نارەق ڕشتن؛ ئەركی گران و ناخۆش.

**swipe** (swīp), *n.* (١) دەسك (وەك هی ترومپای بیر).

(٢) [Colloq.]. پیامالینێکی توند؛ لێدانێکی قایم؛ زرمە.

*v.t.* (١) بە توند لێدان؛ بە توند پیامالین.

(٢) [Slang] لرف لێدان؛ پیاکێشان؛ دزین؛ پیادان.

*v.i.* [Colloq.], پیامالین بە قایم؛ بە توند لێدان یا پیاکێشان.

**swipes** (swīps), *n.pl.* [British Slang], بیرەی گەند یا خراپ.

**swirl** (swûrl), *v.i.* (١) خولانەوە (وەك گێژاو یا گەردەلوول)؛ سووڕانەوە.

(٢) سەر گێژبوون؛ سەرخولانەوە.

*v.t.* خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە

*n.* (١) خولانەوە؛ سووڕانەوە. (٢) گێژاو؛ گەرداو؛ گەردەلوول.

(٣) شتێكی لوول (وەك قژ)؛ شتی خول خواردوو یا پێچ پێچۆكە.

**-swirly** *(adj.)*.

**swish** (swish), *v.i.* خشە لێوەهاتن؛ وورشە لێوەهاتن (جلی تازە).

*v.t.* (١) خشە لێوەهێنان؛ وورشە لێوەهێنان.

(٢) داركاری كردن؛ قامچی لێدان

*n.* (١) خشە ووڕشە. (٢) (ا) داری لێدان؛ داری فەلاقە.

(ب) لێدانێك ب پیامالینێك بە داری فەلاقە.

**Swiss** (swis), *adj.* سویسری (گەل، كلتوور).

*n.* هاوولاتی سویسرە؛ سویسری.

**the Swiss,** سویسرییەكان؛ گەلی سویسرە.

**Swiss chard,** سلق.

**Swiss cheese,** جۆرە پەنیرێكی سپی كون كوناوییە.

**switch** (swich), *n.* (١) شوولك؛ شوولە داری داركاری.

(٢) سەرە تووكتەكەی كلكی گا و مانگا (٣) پرچی دەستكرد.

(٤) پیامالینێكی لەپڕو قایم بە شوولكەدار یا قامچی.

(٥) سویچی كارەبا؛ كلیلی كارەبا.

(٦) كلیلی گۆڕینی هێلی شەمەندەفەر. (٧) گۆڕین؛ ئالوگۆڕ.

*v.t.* (١) لێدان بە شوولكەدار؛ لێدان بە قامچی. (٢) ڕاتەكاندن یا ڕاوەشاندن.

(٣) گۆڕین؛ لابردن؛ لادان.

(٤) ( ~ on; ~ off ) ، داگیرساندن و كوژاندنەوەی گلۆپ و ئامێری كارەبایی.

(٥) گواستنەوەی شەمەندەفەر لە هێلێكەوە بۆ هێلێكی تر بە كلیلی گواستنەوە؛ ئالوگۆڕ پێكردن.

(٦) [Colloq.]. گۆڕینەوە؛ ئالوگۆڕكردن: *( We ~ed places.)* .

*v.i.* (١) گواستنەوە یا گۆڕان لە هێلێكەوە بۆ هێلێكی تر (شەمەندەفەر)؛ ئالوگۆڕپێكردن. (٢) گۆڕین؛ گۆڕان؛ لابردن.

**switchback** (swich′bak′), *n.* (١) هێلی شەمەندەفەر یا ڕێگەی پێچاوپێچی بە بەرەوژووركە هەلگەڕاودا (٢) [British]، **roller coaster** .

**switch-blade knife,** چەقۆیەكی گەورەیە بە دوگمە دەكرێتەوەو دادەخرێ

**switchboard** (swich′bôrd′, swich′bōrd′), *n.* كلیلبەند (ئەلەكتریك، تەلەفۆنخانە).

**switch-knife** = **switch-blade knife.**

**switchman** (swich′mən), *n.* گۆڕەر كارگەری شەمەندەفەر گۆڕین لە هێلێكەوە بۆ هێلێكی تر.

**switchyard** (swich′yärd′), *n.* گۆڕینگەی شەمەندەفەر؛ گۆڕەپانی گۆڕینی شەمەندەفەر لە هێلێكەوە بۆ هێلێكی تر.

**Switzer** (swit′sẽr), *n.* (١) سویسری

(٢) سەربازێكی بەكرێ گیراوی سویسری.

**swivel** (swiv′'l), *n.* (١) ئەلقەی خولاوەی زنجیرێك.

(٢) تەوەری كورسی خولاوە (٣) **swivel gun**

*v.t.* (١) خولاندنەوە بە دەوری خۆدا؛ چەرخاندن. (٢) تەوەری خولانەوە بۆ كردن.

*v.i.* خولانەوە بە دەوری خۆدا

**swivel chair,** كورسی خولاوە.

**swivel gun,** تۆپی خولاوە: تۆپێكە دەخولێنرێتەوە بە دەوری خۆیداو تەقەی پێ دەكرێ.

**swizzle** (swiz′'l), *n.* سویزل: كۆكتێلێكە لە خواردنەوەی مەستكەرو لیمۆو شەكر پێكدێت.

**swizzle stick,** داری تێكهەلدانی "سویزل" (ووشەی پێشوو ببینە).

**swob** (swob), *n.* & *v.t.* = **swab.**

**swollen** (swō′lən), *alternative past tense of* **swell.**

*adj.* هەلئاوساو؛ ئاوساو؛ هەوكردوو؛ هەلتۆقیو.

**swoon** (swōōn), *v.i.* بووڕانەوە؛ لە هۆش خۆ چوون.

*n.* بووڕانەوە؛ لە هۆش خۆ چوون.

**swoop** (swōōp), *v.t.* ( ~ **up**), پڕپیاكردن؛ شالاو بۆ بردن؛ ڕفاندن.

*v.i.* ( ~ **down**; ~ **upon**), شالاو بۆ بردن؛ خۆ پیادان (وەك هەلۆ یا واشە)؛ لەپڕ بەسەرداردان؛ پڕ پیاكردن:

*( The hawk ~ed down on its prey.)*

*n.* لەپڕ بەسەرداردان؛ پڕپیاكردن؛ شالاو.

**swop** (swop, swôp), *n.*, *v.t.* & *v.i.* = **swap.**

**sword** (sôrd, sōrd), *n.* (١) شیر؛ شمشێر.

(٢) (ا) هێزی سوپایی. (ب) سوپا؛ سەربازێتی. (ج) شەڕ؛ جەنگ.

**at sword's points,** شیرو تیر لەیەك دەسوون؛ ئامادەن بۆ شەڕ لەگەل یەكتر.

**cross swords,** (١) شەڕكردن. (٢) مشتومڕی توندوتیژ كردن.

**put to the sword,** كوشتن؛ كوشتن بە شیر.

**sword bayonet,** سونگی؛ سونگییەكە لە شێوەی شیردا.

**sword-bill** (sôrd′bil′, sōrd′bil′), *n.* دەنووك شیری: جۆرە باڵندەیەكی بچووكی ئەمەریكای باشوورە دەنووكێكی زۆر درێژی هەیە.

**sword cane,** كیفێكە لە شێوەی داردەستدا شیری تێدا دەشارێتەوە.

**sword-craft** (sôrd′kraft′, sōrd′kräft′), *n.* (١) شیربازی.

(٢) تەكتیكی جەنگ؛ پیلانی جەنگ.

**sword dance,** شیرە سەما.

**sword-fish** (sôrd′fish′, sōrd′fish′), *n.* شیرە ماسی: ماسییەكی دەریایی گەورەی لمۆز درێژە.

**sword grass,** گیا شیری: چەند جۆرە گیایەكن تەلەكانیان لە شیر دەچێ.

**sword knot,** قولفەی مشتووی شیر.

**sword-play** (sôrd′plā′, sōrd′plā′), *n.* شیربازی.

**swordsman** (sôrdz′mən), *n.* *Also* **swordman,** شیرباز؛ شمشێرباز؛ شمشێروەشێن.

**swordsmanship** (sôrdz′mən-ship′), *n.* شیربازی؛ شمشێربازی.

**swordtail** (sôrd′tāl′, sōrd′tāl′), *n.* ماسییەكی بچووكی ڕەنگاو- ڕەنگی ڕووبارییە بۆ جوانی بەخێودەكرێ.

**swore** (swôr, swōr), *past tense of* **swear.**

**sworn** (swôrn, swōrn), *past participle of* **swear.**

*adj.* سوێند لەسەر خوراو.

**swot** (swot), *n.* & *v.t.* = **swat.**

**swum** (swum), *p.p. and archaic past tense of* **swim.**

**swung** (swuŋ), *p.p. and alternative past tense of* **swing.**

**swung dash,** ئەم نیشانەیە ( ~ ) كە لە چاپەمەنیدا بەكاردەهێنرێت لەباتی ووشەیەك یا بەشی ووشەیەكی لەوەوپێش نووسراو بۆ جێگە كەم گرتن.

**Sybarite** (sib′ə-rīt′), *n.* (١) هاوولاتییەكی "سیباریس" كە شارێكی كۆنی یۆنانی بوو لە لاخوارووی ئیتالیا.

(٢) [s-]، خۆشی پەرست؛ كەسێكە كە زۆر حەز لە خۆشی و ڕابواردن دەكات.

**-sybaritic; sybaritical** *(adj.)*; **sybaritically** *(adv.)*.

**sycamine** (sik′ə-min, sik′ə-mīn′), *n.* شاتوو.

**sycamore** (sik′ə-môr′, sik′ə-mōr′′), *n.* (١) هەنجیری فیرعەون؛ هەنجیرە توو. (٢) درەختێكە لە سوورەچنار دەچێ؛ سوورەچنار.

**syce** (sīs), ***n.*** مەیتەر (بەتایبەتی لە هیند).
**sycee** (sī-sē′), ***n.*** پارەیەکی زیوی چینی کۆنە.
**syconium** (sī-kō′ni-əm), ***n.*** میوەی گۆشتنی وەك هەنجیر.
**sycophancy** (sik′ə-fən-si), ***n.*** مەراییکاری؛ مەرایی؛ کاسەلیسی؛ کلکەلەقێ؛ مفتخۆری.
**sycophant** (sik′ə-fənt), ***n.*** مەراییکەر؛ کلکەلەقێکەر؛ ڕووباز؛ کاسەلیس؛ مفتخۆر.
**-sycophantic; sycophantical** ***(adj.)***; **sycophantically** ***(adv.)***
**sycosis** (sī-kō′sis), ***n.*** نەخۆشی‌یەکی پێستە بە زۆری تووشی دەم‌وچاو دەبێت دەبێتە هۆی سووربوونەوەو قنچکە لێ هاتنی بنجی ڕیش.
**syenite** (sī′ə-nīt′), ***n.*** بەردێکی ئاگرپڕژێنی‌یە.
**syllabary** (sil′ə-ber′i), ***n.*** ئەلف‌وبێی برگەیی: خشتەیەك یا شێوازێکی ئەلف‌وبێ‌یە کە هەر یەکەی برگەیەك دەردەبڕێ یا دەنوێنێ.
**syllabi** (sil′ə-bī′), *plural of* **syllabus.**
**syllabic** (si-lab′ik), ***adj.*** (١) برگەیی (زمان)؛ تایبەتی بە برگە.
(٢) تایبەتی بە تیپێکی نەبزوێن کە خۆی بە تەنها وەك برگەیەك دەووترێ.
(وەك " *l* " لە ووشەی " **riddle** " دا).
(٣) برگە برگەو بە ڕوونی دەووترێ یا دەخوێنرێتەوە.
(٤) تایبەتی بە جۆرە هۆنراوەیەك کە دێرەکانی بە ژمارەی برگە ڕێکخراون.
***n.*** دەنگی برگەیی؛ تیپی برگەیی.
**-syllabically** ***(adv.).***
**syllabicate** (si-lab′i-kāt′), ***v.t.*** = **syllabify.**
**syllabication** (si-lab′i-kā′shən), ***n.*** = **syllabification.**
**syllabification** (si-lab′ə-fi-kā′shən), ***n.*** برگەکاری؛ ووشە بەشکردن بە برگەوە؛ ووشە برگە برگە کردن.
**syllabify** (si-lab′ə-fī′), ***v.t.*** برگە برگە کردنی ووشە؛ بەشکردنی ووشە بە برگەوە.
**syllabism** (sil′ə-biz'm), ***n.*** (١) ئەلف‌وبێی برگەیی بەکارهێنان؛ بەکارهێنانی ئەلف‌وبێ‌یەك کە هەر یەکەیان برگەیەك دەردەبڕن.
(٢) بەش بوون بە برگە برگەوە.
**syllabize** (sil′ə-bīz′), ***v.t.*** = **syllabify.**
**syllable** (sil′ə-b'l), ***n.*** (١) برگەی دەنگ (زمان).
(٢) برگەی ووشە؛ کەرتە ووشە. (٣) وورتە؛ نەختە دەنگێك؛ فزە.
***v.t. & v.i.*** بە برگە برگە ووتن.
**syllabub** (sil′ə-bub′), ***n.*** = **sillabub.**
**syllabus** (sil′ə-bəs), ***n.*** (١) بەرنامەی وانە یا کۆرسی وەرزێکی پرۆگرامی وانە یا کۆرس. (٢) پێشەکی بڕیاری دادگا.
**syllogism** (sil′ə-jiz'm), ***n.*** (١) لێکدانەوەی پێوانەیی (ژیربێژی).
(٢) ئەنجام لێکدانەوە لە گشتی‌یەوە بۆ تایبەتی.
(٣) ئەنجام لێکدانەوەیەکە کە بە ڕووالەت ڕێك‌وپێکەو لە ڕاستیدا چەوتە.
**syllogist** (sil′ə-jist), ***n.*** شارەزای ئەنجام لێکدانەوەی پێوانەیی.
**syllogistic** (sil′ə-jis′tik), ***adj.*** هی لێکدانەوەی پێوانەیی.
**-syllogistical** ***(adj.)***; **syllogistically** ***(adv.).***
**syllogize** (sil′ə-jīz′), ***v.t.*** لێکدانەوەی پێوانەیی (ژیربێژی).
**sylph** (silf), ***n.*** (١) بوونەوەرێکی ئەفسانەیی ناو هەوایە.
(٢) کچ یا ژنێکی قەد باریك‌و شۆخ.
**sylva** (sil′və), ***n.*** = **silva.**
**sylvan** (sil′vən), ***adj.*** *Also* **silvan,** (١) دارستانی.
(٢) نیشتەجێی دارستانە؛ لە دارستاندا دەبینرێ یا هەیە.
(٣) دارستاناوی؛ بێشەلانی؛ دارودرەختاوی.
***n.*** (١) نیشتەجێی دارستان. (٢) فریشتەی دارستان؛ پەروەردگاری دارستان.
**sylvanite** (sil′vən-īt′), ***n.*** سلڤانیت: جۆرە کانزایەکە.
**sylvite** (sil′vīt), ***n.*** سلفیت: جۆرە کانزایەکە.
**sym-** (sim), = **syn-.**
**symbiont** (sim′bī-ont′, sim′bi-ont′), ***n.*** زیندەوەرێکە کە لەگەڵ زیندەوەرێکی تردا دەژی بۆ سوودی هەردووکیان؛ زیندەوەری هاودەستەبەر یا هاوسوود.
**symbiosis** (sim′bī-ō′sis, sim′bi-ō′sis), ***n.*** پێکەوە ژیانی دوو زیندەوەری جیا بۆ سوودی هەردووکیان؛ سوود گەیاندن بە یەکتر.
**symbiotic** (sim′bī-ot′ik), ***adj.*** *Also* **symbiotical,** سوودگەیێن بە یەکتر؛ هاوسوود؛ هاودەستەبەری؛ بۆ هەردوولا باشە:
***( a ~ relationship )***
**symbol** (sim′b'l), ***n.*** (١) نیشانە؛ هێما؛ درووشم:
***( The dove is a ~ of peace.)***
(٢) نیشانەی نووسراو؛ هێمای نووسراو.
***v.t.*** نیشانەی ئەوەبوون؛ نیشانەی بوون بۆ؛ نیشانەدان.
**symbolic** (sim-bol′ik), ***adj.*** *Also* **symbolical,** (١) تایبەتی بە نیشانە؛ نیشانەیی. (٢) نیشانەیی؛ هێمایی. (٣) نیشانە بەکارهێن.
**-symbolically** ***(adv.).***
**symbolism** (sim′b'l-iz'm), ***n.*** (١) نیشانەکاری (بەتایبەتی لە هونەردا)؛ نیشانەگەری؛ شت دەربڕین بە نیشانە (هونەر، وێژە، کردەوە...هتد).
(٢) کۆمەڵە نیشانە؛ نیشانەگەل. (٣) مانای نیشانەیی.
(٤) دەستەی نیشانەکاران (هونەر، وێژە).
(٥) بیروباوەڕو بۆچوونی دەستەی نیشانەکاران.
**symbolist** (sim′b'l-ist), ***n.*** (١) نیشانەکار؛ نیشانەگەر.
(٢) نیشانەکار (هونەر، وێژە).
(٣) نیشانەزان؛ کەسێکی لێهاتوو لە نیشانە لێکدانەوەدا.
**-symbolistic** ***(adj.)***; **symbolistically** ***(adv.).***
**symbolize** (sim′b'l-īz′), ***v.t.*** (١) نیشانە بوون بۆ؛ نیشانەی ئەوە بوون؛ ئەوە گەیاندن. (٢) بە نیشانە دەربڕین؛ نیشانە بەکارهێنان؛ بە نیشانە نواندن (٣) کردن بە نیشانە؛ وەك نیشانە سەیرکردن.
**-symbolization** ***(n.).***
**symbology** (sim-bol′ə-ji), ***n.*** (١) نیشانەی لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە.
(٢) نیشانەکاری؛ نیشانەگەری؛ نیشانە بەکارهێنان بۆ مەبەست دەربڕین.
**symmetalism** (sim-met′'l-iz'm), ***n.*** شێوازێکی سکە یا پارەی ڕەقە بریتی‌یە لە دوو کانزا بەکارهێنان.
**symmetrical** (si-met′ri-k'l), ***adj.*** *Also* **symmetric,** ڕێك؛ ڕێك‌وپێك؛ بە ئەندازە؛ هاوتا؛ بەرامبەر؛ گونجاو.
**-symmetrically** ***(adv.).***
**symmetrize** (sim′ə-trīz′), ***v.t.*** ڕێك‌وپێك کردن؛ بە ئەندازە کردن؛ بەرامبەرکردن؛ هاوتاکردن.
**symmetry** (sim′ə-tri), ***n.*** ڕێك‌وپێکی؛ ڕێکی؛ هاوتایی؛ بەرامبەری؛ گونجان.
**sympathetic** (sim′pə-thet′ik), ***adj.*** (١) هاوسۆز؛ دڵ پێ سووتاو؛ هاوهەست. (٢) گونجاو (لەگەڵ‌و هەست‌و بیروڕادا)؛ شیاو؛ هاو حەزو ڕەفتار.
(٣) [Colloq.]، پەسەندکەر؛ لایەنگر.
**-sympathetical** ***(adj.)***; **sympathetically** ***(adv.).***
**sympathetic ink,** مەرەکەبی نەبینراو؛ مەرەکەبی نهێنی.
**sympathize** (sim′ə-thīz′), ***v.i.*** (١) هاوسۆزی کردن؛ هاوڕا بوون؛ هاوهەستی لەگەڵ کردن. (٢) دڵ پێ سووتان؛ هاوخەمی کردن؛ بەشداری خەم بوون؛ بەزەیی پیاهاتنەوە: ***( He ~s with poor people.)*** .
(٣) گونجان؛ پەسەندکردن.
**sympathy** (sim′pə-thi), ***n.*** (١) هاوسۆزی؛ هاوهەستی؛ هاوسۆزایەتی. (٢) گونجان؛ ڕێکەوتن؛ کۆکی؛ چوونیەکی.
(٣) دڵ پێ سووتان؛ هاوخەمی؛ بەشداریتی خەم؛ بەزەیی.
(٤) هاوهەستی ئەندامانی لەش (بە جۆرێك کە ئازارو نەخۆشی ئەندامێك ببێتە هۆی هەمان ئازار لە ئەندامێکی تردا).
**sympathy** ( or **sympathetic**) **strike,** مانگرتنی لایەنگیری. مانگرتنی کرێکارانی کارگەیەکە بۆ پشتگیری کردنی کرێکارانی مانگرتووی کارگەیەکی تر.

**sympetalous** (sim-pet′'l-əs), *adj.* = **gamopetalous.**
**symphonic** (sim-fon′ik), *adj.* (١) سیمفۆنی؛ لە سیمفۆنی دەچێ.
(٢) هاوئاواز؛ ساز؛ هاودەنگ؛ یەک ئاواز.
**symphonic poem,** هەڵبەستی سیمفۆنی: سیمفۆنییەکی درێژە لەسەر هەڵبەستێک دانراوە.
**symphonious** (sim-fō′ni-əs), *adj.* هاوئاواز؛ یەک ئاواز؛ ساز؛ هاودەنگ.
**symphonist** (sim′fōn-ist), *n.* سیمفۆنی دانەر؛ سیمفۆنی ساز.
**symphonize** (sim′fə-nīz′), *v.t.* یەک دەنگ کردن؛ هاودەنگ کردن.
**symphony** (sim′fə-ni), *n.* (١) هاوئاوازی؛ هاوئاوازی؛ یەک دەنگی.
(٢) هاوڕەنگی؛ یەک ڕەنگی.
(٣) (ا) سیمفۆنی: ئاوازێکی درێژخایەنی مۆسیقایە کە ئۆرکسترا لێی دەدات.
(ب) ئۆرکیسترا. (ج) [Colloq.]: ئاهەنگی سیمفۆنی.
**symphony orchestra,** ئۆرکێسترا؛ ئۆرکێسترای سیمفۆنی؛ تیپێکی مۆسیقای گەورەیە بۆ سیمفۆنی لێدان.
**symphysis** (sim′fə-sis), *n.* (١) (ا) پەیوەست بوونی دوو ئێسقانی جیا (توێکاری). (ب) جێی ئەم پەیوەست بوونە.
(٢) پەیوەست بوونی دوو ئەندامی ڕووەک.
**sympodium** (sim-pō′di-əm), *n.* قەدە دارێکە کە لە چەندەها لق پێکهاتووە (وەک دارمێو).
**symposiac** (sim-pō′zi-ak′), *adj.* کۆڕی؛ تایبەتی بە کۆڕ.
*n.* = **symposium.**
**symposiarch** (sim-pō′zi-ärk′), *n.* (١) کۆڕگێڕ. (٢) ئاهەنگگێڕ.
**symposium** (sim-pō′zi-əm), *n.pl.* **symposiums, symposia,** (١) ئاهەنگ‌وکۆڕی لێکۆڵینەوە (لە یۆنانی کۆندا).
(٢) کۆڕ؛ کۆبوونەوەیەکە بۆ بەراوردکردن و لێکۆڵینەوەی بیروڕا.
(٣) چەند بیروڕا یا وتارێکە دەربارەی باسێکی تایبەتی.
**symptom** (simp′təm), *n.* نیشانەی نەخۆشی؛ نیشانە.
**symptomatic** (simp′tə-mat′ik), *adj.* (١) نیشانەیی؛ تایبەتی بە نیشانە. (٢) نیشانەی فلان نەخۆشییە. (٣) نیشانەی ئەوەیە؛ ئەوە دەگەیەنێ.
**symptomatology** (simp′təm-ə-tol′ə-ji), *n.* نیشانەناسی (پزیشکەوانی): زانستی نیشانەی نەخۆشی. (هەروەها " semiology " ببینە).
**syn-** (sin), پێشگرێکە بەمانای: (ا) پێکەوە. (ب) لە هەمان کاتدا.
**synaesthesia** (sin′əs-thē′zhə, sin′əs-thē′zhi-ə), *n.* = **synesthesia.**
**synagogue** (sin′ə-gôg′), *n. Also* **synagog,** کۆبوونەوەی جوولەکە بۆ نوێژو خوا پەرستن یا ئاین خوێندن؛ کۆڕی ئاینی جوولەکە.
(٢) کەنیشتە؛ پەرستگای جوولەکە.
**synapse** (si-naps′), *n.* جێی لێکدانی هەستە دەمار.
**synapsis** (si-nap′sis), *n.* (١) جووت بوونی کرۆمۆسۆم (زیندەوەرزانی). (٢) **synapse**.
**synchro** (siŋ′krə), *n.* = **selsyn.**
**synchro-** (siŋ′krə), پێشگرێکە بەمانای: هاوکات.
**synchronal** (siŋ′krə-nəl), *adj.* = **synchronous.**
**synchronic** (sin-kron′ik, siŋ-kron′ik), *adj.* = **synchronous.**
**synchronism** (siŋ′krə-niz′m), *n.* (١) ڕوودانی هاوکاتی؛ هاوکاتی. (٢) ڕێکخستنی مێژوویی: لیستەکردنی ڕووداو و کەسانی مێژوویی بەپێی کاتی ڕوودانیان.
-**synchronistic; synchronistical** *(adj.).*
**synchronize** (siŋ′krə-nīz′), *v.i.* هاوکات بوون؛ لە هەمان کاتدا ڕوودان.
*v.t.* (١) هاوکات کردن (کاتژمێر، چالاکی، کردەوە ... هتد).
(٢) هاوکات یا هاوسەردەم کردنی ڕوودان.
(٣) هاوکات کردنی گفتوگۆو وێنەی فیلمی سینەما.
-**synchronization** *(n.).*
**synchronized** (siŋ′krə-nīzd′), *adj.* هاوکاتی؛ هاوکات.
**synchronizer** (siŋ′krə-nīz′ĕr), *n.* ئامێری هاوکاتکەر؛ هاوکاتکەر.
**synchronous** (siŋ′krə-nəs), *adj.* (١) هاوکات؛ هاوکاتی.
(٢) هەمان کات پێ چوو؛ هاوکات خایەن؛ هاوماوە.
**synchrony** (siŋ′krə-ni), *n.* ڕوودان یا بزوانی هاوکات.
**synchroscope** (siŋ′krə-skōp′), *n.* دۆزەرەوەی هاوکاتی دوو مەکینە.
**syncopate** (siŋ′kə-pāt′), *v.t.* (١) (ا) کورتکردنەوەی ووشە بە لابردنی تیپی ناوەوەی. (ب) لابردنی تیپ یا دەنگی ناوەوەی ووشە (بۆ کورتی).
(٢) گۆڕینی دەنگی هێز خراوەسەر (مۆسیقا).
(٢) ئاڵوگۆڕکردنی هێزی سەر دەنگەکانی پارچەیەک مۆسیقا.
-**syncopator** *(n.).*
**syncopation** (siŋ′kə-pā′shən), *n.* (١) ووشە کورتکردنەوە بە لابردنی تیپی ناوەڕاستی.
(٢) پارچەیەک مۆسیقایە کە هێزی سەر دەنگەکانی ئاڵوگۆڕ کرابێ.
(٣) **syncope**.
**syncope** (siŋ′kə-pi, sin′kə-pē′), *n.* (١) لابردنی تیپ یا دەنگ لە ناوەڕاستی وشە (وەک " wooster " لەباتی " worcester ")
(٢) لەهۆش خۆ چوون؛ بوورانەوە.
(٣) **syncopation**.
**syncretism** (siŋ′krə-tiz′m), *n.* (١) گونجاندن یا سازاندنی بیروباوەڕی ئاینی و فەلسەفی جیاواز لەگەڵ یەکتریدا.
(٢) یەکگرتنی دوو شێوەی جیاوازی دوایی پێهێنانی ووشە (ڕێزمان).
-**syncretistic; syncretic** *(adj.)*; **syncretist** *(n.).*
**syncretize** (siŋ′krə-tīz′), *v.t. & v.i.* سازاندن (بیروباوەڕی ئاینی و فەلسەفی جیاوان)؛ گونجاندن؛ پێکهێنان.
**syncrisis** (siŋ′kri-sis), *n.* بەراوردکردن (ڕەوانبێژی).
**syndactyl, syndactyle** (sin-dak′til), *adj. Also* **syndactylous,** پەنجە پەیوەست؛ دوو پەنجە یا زیاتر کە لە یەکیان داوە بە پەردە (زیندەوەرزانی).
*n.* باڵندە یا گیاندارێکی پەنجە پەیوەست.
-**syndactylism** *(n.).*
**syndesmosis** (sin′des-mō′sis), *n.* ئێسقان پەیوەستی.
-**syndesmotic** *(adj.).*
**syndetic** (sin-det′ik), *adj.* (١) بەیەک گەیێن (ڕێزمان).
(٢) بەیەک گەیێنراو (ڕێزمان).
(٣) هی بەیەک گەیێن.
**syndic** (sin′dik), *n.* (١) نوێنەری بازرگانی زانکۆیەک یا کۆمپانیایەک.
(٢) فەرمانبەری میری (وەک دادوەری ئاسایش).
-**syndical** *(adj.).*
**syndicalism** (sin′di-k'l-iz'm), *n.* دەستبەسەرداگرتنی دەسگا پیشەسازی و میرییەکان لەلایەن یەکێتی کرێکارانەوە لە ڕێی مانگرتنەوە؛ بیروڕای ئەم دەستبەسەرداگرتنە.
-**syndicalist** *(adj. & n.)*; **syndicalistic** *(adj.).*
**syndicate** (sin′di-kit), *n.* (١) سیندیکیت: (ا) یەکگرتنی چەند دەسگایەکی بازرگانییە بۆ دەستبەسەرداگرتنی بازاڕ.
(ب) ئەنجوومەنێکە کارێک یا سەوداگەرییەکی پێ سپێرراوە.
(ج) ڕێکخراوەی دەسبڕان و ڕاووڕووتکەران.
(د) یەکگرتنی دەستەیەکە لە سەرمایەداران بۆ بەدیهێنانی پرۆژەیەک.
(٢) دەسگای ووتار فرۆشتن بە ڕۆژنامەو گۆڤاری جۆراوجۆر.
(٣) ئەنجوومەن و دەسەڵاتی دەستەی فەرمانبەرانی میری (وەک دادوەری ئاسایش).
*v.t.* (١) پێکهێنانی "سندیکیت" (ژمارە یەک ببینە).
(٢) ووتار فرۆشتن بە ڕۆژنامەو گۆڤاری جۆراوجۆر.

***v.i.*** بوون بە " سیندیکیت".

-syndication *(n.)*; syndicator *(n.)*.

**syndrome** (sin′drōm, sin′drə-mē′), ***n.*** (١) کۆمەڵە نیشانەی هاوکات (نەخۆشی لەش یا دەروون). (٢) نیشانەکانی بارودۆخ یا ڕووداوێکی نالەبار و نایەسەند.

**syne** (sīn), ***adv., conj., & prep.*** [Scot.], لەو کاتەوە؛ لە؛ لەمەوپێش.

**synecdoche** (si-nek′də-ki), ***n.*** جۆرێکە لە مەجاز بریتییە لە بەکارهێنانی بەشێك لەباتی هەموو یا بە پێچەوانەوە (ڕەوانبێژی). (وەك " bread " بۆ " food " وە " army " بۆ " soldier ").

**syneresis** (si-ner′ə-sis), ***n.*** لێکدانی دوو تیپە بزوێن و بوونیان بە یەك دەنگ (دەنگناسی).

**synergetic** (sin′ēr-jet′ik), ***adj. Also*** **synergic,** هاوکاریکەر؛ پێکەوە نیشکەر: ( *~ muscles)* .

**synergism** (sin′ēr-jiz'm), ***n.*** (١) هاوکاری (دوو ئەندامی لەش یا دەرمان بۆ ئەنجامێك کە هیچ کامیان بە تەنها ناتوانن باش بیهێننە دی). (٢) هاوکاری خواستی مرۆڤ خۆی و میهرەبانی خودا بۆ نوێ کردنەوەو بووژانەوەی مرۆڤ و باری ژیانی.

**synergist** (sin′ēr-jist), ***n.*** (١) ئەندامی لەش یا دەرمانی هاوکار. (٢) بڕواداری هاوکاری خواستی مرۆڤ و میهرەبانی خودا بۆ نوێ بوونەوەی باری ژیانی مرۆڤ.

-synergistic; synergistical *(adj.)*.

**synergy** (sin′ēr-ji), ***n.*** = synergism.

**synesis** (sin′ə-sis), ***n.*** جیاوازی ژمارەو ڕێکەوتنی مانای دوو وشەی ڕستە (ڕێزمان): *( If anyone arrives, tell them to wait.)* .

**synesthesia, synaesthesia** (sin′əs-thē′zhə), ***n.*** هاوهەستی هاوکاتی جووڵانی یەکێك لە هەستەکانی مرۆڤ بە جووڵێنەری هەستێکی تر (وەك چۆن بیستنی دەنگێك دەبێتەهۆی ڕەنگ هێنانە بەرچاوی خۆ).

**syngamy** (siŋ′gə-mi), ***n.*** جووت بوونی دوو زیندەوەری یەك خانەیی بۆ زاوزێ.

-syngamic; syngamous *(adj.)*.

**syngenesis** (sin-jen′ə-sis), ***n.*** زاوزێ.

**synizesis** (sin′ə-zē′sis), ***n.*** لێکدانی دوو تیپە بزوێن (دەنگناسی)؛ لێکدانی دوو بڕگە بە لێکدانی تیپە بزوێنەکانیان.

**synod** (sin′əd), ***n.*** (١) کۆڕی کڵێسە؛ کۆڕی کاربەدەستانی کڵێسە. (٢) کۆڕ.

-synodal *(adj.)*.

**synodical** (si-nod′i-k'l), ***adj. Also*** **synodic,** (١) تایبەتی بە کۆڕی کڵێسە؛ کڵێسەیی (کۆڕ)؛ کۆڕی. (٢) نزیکبوونەوە یا جووت بوونی دوو ئەستێرەی گەڕۆك؛ ماوە یا کاتی نێوان دوو نزیکبوونەوەی وەها (وەك هی مانگ و ڕۆژ).

**synoecious** (si-nē′shəs), ***adj.*** نێرك و نێرەکی هەردووك پێوەیە (ڕووەکناسی)

**synonym** (sin′ə-nim), ***n.*** (١) وشەی هاوواتا؛ وشەی هاومانا یا هاومەبەست. (٢) metonym . (٣) ناوی کۆن یا باونەماو (زیندەوەرزانی).

-synonymic; synonymical *(adj.)*.

**synonymity** (sin′ə-nim′ə-ti), ***n.*** هاوواتایی؛ هاومانایی؛ هاومانایەتی.

**synonymize** (si-non′ə-mīz′), ***v.t.*** هاوواتا کردن؛ وشەی هاومانا بۆ دۆزینەوە.

**synonymous** (si-non′ə-məs), ***adj.*** هاوواتا؛ هاومانا؛ هاومەبەست.

**synonymy** (si-non′ə-mi), ***n.*** (١) لێکۆڵینەوەی وشە هاوواتاکان. (٢) (أ) لیستەی وشەی هاوواتا. (ب) لیستە کردنی وشەی هاومانا. (٣) لیستەی مێژوویی ناوەکانی توخمێك (زیندەوەرزانی). (٤) هاوواتایی؛ هاومانایی؛ هاوواتایەتی.

**synopsis** (si-nop′sis), ***n.*** کورتە: *( the ~ of a story, play, novel, etc.)*

**synoptic** (si-nop′tik), ***adj.*** (١) کورتەیی؛ تایبەتی بە کورتە. (٢) هاوڕا؛ لە هەمان باری سەرنجەوە نووسراو (سێ بەشەکەی یەکەمی ئینجیل).

-synoptical *(adj.)*; synoptically *(adv.)*.

**synostosis** (sin-os′tō′sis), ***n.*** پەیوەستی دوو ئێسقانی ئێسکی.

**synovia** (si-nō′vi-ə), ***n.*** شلەیەکی لینجی چەورکەرە پەردەی جومگەو ژێ ماسولکەیییەکان دەری دەدەن.

**synovitis** (sin′ə-vī′tis), ***n.*** هەوکردنی پەردەی جومگەو ژێ ماسولکەیییەکان.

**synsepalous** (sin-sep′'l-əs), ***adj.*** = gamosepalous.

**syntactical** (sin-tak′ti-k'l), ***adj. Also*** **syntactic,** تایبەتی بە ڕستە دارشتن؛ هی ڕستەسازی.

-syntactically *(adv.)*.

**syntactics** (sin-tak′tiks′), ***n.*** زانستی نیشانە؛ نیشانەناسی.

**syntax** (sin′taks), ***n.*** (١) ڕێکوپێکی؛ ڕیزکردنی ڕێکوپێك. (٢) ڕستەسازی (ڕێزمان)؛ ڕستە دارشتن؛ چۆنێتی ڕستە دارشتن و پیشاندانی پەیوەندی نێوان وشەکانی ڕستە.

**synthesis** (sin′thə-sis), ***n.*** (١) پێکهێنان؛ یەکخستن؛ یەکگرتن. (٢) شتی پێکهاتوو لە چەند شتێکی تر. (٣) پێکهاتنی ئاوێتەی کیمیایی؛ ئاوێتەی ئاسادە. (٤) لێکدانەوە یا ئەنجامکاری لە بەشێکەوە بۆ گشت وە لە سادەوە بۆ ئاسادە (فەلسەفە)

-synthesist *(n.)*.

**synthesize** (sin′thə-sīz′), ***v.t.*** یەکخستن؛ یەك پێکرتن؛ کۆکردنەوە؛ پێکهێنان لە چەند پارچە یا بەشێك.

**synthetic** (sn-thet′ik), ***adj.*** (١) پێکهێنراو؛ یەکخراو. (٢) درووستکراو لە چەند شتێك بەشێوەیەکی کیمیایی. (٣) دەستکرد؛ ناسرووشتی. (٤) پێشگرو پاشگری زۆرە (زمان)؛ پڕە لە وشەی لێکدراو.

-synthetical *(adj.)*; synthetically *(adv.)*.

**synthetize** (sin′thə-tīz′), ***v.t.*** = synthesize.

**sypher** (sī′fēr), ***v.t.*** نێرەومێیە کردن یا سواری یەکتری کردنی قەراغی تەختە بۆ سفت و سافی.

**syphilis** (sif′ə-lis), ***n.*** ئاتەشەك؛ فەرەنگی؛ ئاگرە؛ سفلس.

**syphilitic** (sif′ə-lit′ik), ***adj.*** فەرەنگیدار؛ ئاتەشەکدار.

***n.*** فەرەنگیدار؛ ئاگرەدار؛ کەسێکە کە فەرەنگی یا ئاگرەی هەبێ.

**syphiloid** (sif′ə-loid′), ***adj.*** لە فەرەنگی یا ئاگرە دەچێ.

**syphilology** (sif′ə-lol′ə-ji), ***n.*** زانستی فەرەنگی یا ئاگرە (پزیشکەوانی).

-syphilologist *(n.)*.

**syphilous** (sif′ə-ləs), ***adj.*** = syphilitic.

**syphon** (sī′fən), ***n., v.i., v.t.*** = siphon.

**Syriac** (sêr′i-ak′), ***adj.*** سریانی.

***n.*** سریانی؛ زمانی سریانی.

**Syrian** (sêr′i-ən), ***adj.*** سووری.

***n.*** (١) سووری؛ هاوڵاتییەکی سووری. (٢) شێوە زمانی عەرەبی سووریا.

**syringa** (sə-riŋ′gə), ***n.*** لەیلاق؛ چەند جۆرە ڕووەکێکن گوڵەکانیان بۆنیان خۆشە.

**syringe** (sə-rinj′, sir′inj), ***n.*** شرینقە؛ سرنج؛ دەرزی.

**syringomyelia** (sə-riŋ′gō-mī-ē′li-ə), ***n.*** نەخۆشییەکی مۆخی بڕبڕەیە.

**syrinx** (sir′iŋks), ***n.*** (١) ئەندامی خوێندنی باڵندە.

**Eustachian tube** (٣) . **panpipe** (٢)

**-syringeal** ***(adj.).***

**syrup** (sir′əp, sūr′əp), ***n.*** خۆشاو، دۆشاو؛ شیلە؛ شیلەی شیرین؛ شەکراو

**syrupy** (sir′əp-i, sūr′əp-i), ***adj.*** (١) زۆر شیرین: ***( ~ coffee, tea, etc.)***

(٢) خۆشاوی؛ دۆشاوی؛ شیرەیی.

(٣) بەسۆز؛ لە ڕادە بەدەر ناسك یا شیرین: ***( a ~ poem; ~ manners)*** .

**syssarcosis** (sis′är-kō′sis), ***n.*** پەیوەست بوونی دوو ئێسقان بە ماسولکە.

**systaltic** (sis-tal′tik), ***adj.*** پلدەر؛ دەچێتەوەیەك و دەكشێت بە نۆبە (وەك دڵ).

**system** (sis′təm), ***n.*** (١) کۆمەڵە. ***( the solar ~ )*** .

(٢) جیهان

(٣) لەش: ***( Greasy food is bad for one's ~ .)*** .

(٤) کۆمەڵە بیروڕایەکی یەکخراو.

(٥) ڕێباز؛ پەیڕەو؛ دەستووری کار؛ نەخشە؛ ڕێگە؛ شێوە: ***( a good ~ of teaching English)***

(٦) ڕژێم: ***( The political ~ is to blame.)*** .

(٧) کۆئەندامی لەش؛ لەش: ***( the digestive ~ )*** .

(٨) دەسگا. (٩) ڕێكوپێكی.

(١٠) چەند ڕێگەیەکی هاتوچۆی بەیەکداچوو: ***( the railway ~ )*** .

**systematic** (sis′tə-mat′ik), ***adj. Also*** systematical, (١) ڕێك و پێك؛ پەیڕەوی؛ لەسەر پەیڕەو ڕۆیشتوو: ***( a ~ approach to solving a problem.)***

(٢) پۆل پۆل کەری (زیندەوەرزانی).

**-systematically** ***(adv.).***

**systematics** (sis′tə-mat′iks), ***n.pl.*** زانستی هاوپۆل کردن؛ هاوپۆلکاری.

**systematism** (sis′təm-ə-tiz′m), ***n.*** (١) هاوپۆلکاری؛ پۆل پۆل کردن. (٢) لەسەر پەیڕەو یا ڕێبازێك ڕۆیشتن.

**-systematist** ***(n.).***

**systematize** (sis′təm-ə-tīz′), ***v.t.*** ڕێکخستن؛ ڕێکخستن بەپێی پەیڕەوێك؛ ڕیزکردن؛ پۆل پۆل کردن؛ ڕێكوپێك کردن.

**-systematization** ***(n.).***

**systemic** (sis-tem′ik), ***adj.*** هەموو لەش دەگرێتەوە؛ بە هەموویدا بڵاوبووەتەوە (ڕێکخراو، دەزگا).

**systemize** (sis′təm-īz′), ***v.t.*** = systematize.

**systole** (sis′tə-lē′), ***n.*** (١) چوونەوەیەکی دڵ؛ کرژبوونی دڵ.

(٢) کورتکردنەوەی بڕگەیەکی درێژ.

**-systolic** ***(adj.).***

**syzygy** (siz′ə-ji), ***n.*** (١) لەیەك نزیکبوونەوەی مانگ و ڕۆژ؛ بەرامبەری مانگ و ڕۆژ. (٢) جووتێ شتی هاوپەیوەندی دار.

# T t

**T, t** (tē), ***n.*** (١) تیپی بیستەمی ئەلفوبێی ئینگلیزی‌یە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " تی " . (٣) (ا) قاڵبی ئەم تیپە.
(ب) ئەم تیپە بە چاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) بیستەم؛ نیشانەی بیستەمە لە ڕیزێکدا.
***adj.*** (١) تایبەتی بەم تیپە. (٢) بیستەم؛ بیستەمین.
**T** (tē), ***n.*** (١) شتێکە لە شێوەی T دا. (٢) ژمارە (١٦٠)ی ڕۆمانی.
***adj.*** لە تیپی " T " دەچێت.
**to a T,** بەتەواوی؛ کتومت؛ دەقاودەق.
**'t,** شێوەی کورتە بۆ " it " : ( do't; 'tis; 'twas ) .
**tab** (tab), ***n.*** (١) قونغە (بۆ شت هەڵواسین یا ڕاکێشان).
(٢) چمکی ڕازێنەرەوەی جل‌وبەرگ.
(٣) گوێچکە کارت یا کاغەزی سەر دەرهێناو (فایلکاری).
(٤) [Colloq.] لیستەی حساب (چێشتخانە).
(٥) ڕوویەکی بچووکە بە باڵی فڕۆکەوە بۆ هاوسەنگی یا لەنگەرگرتن.
**keep tab ( or tabs ) on,** چاودێری کردن (بۆ جڵەو گرتن)؛
سووسە بە سەرەوە کردن؛ حساب بۆ ڕاگرتن.
**tabanid** (tab'ə-nid), ***n.*** خەرەنگەز؛ خەرەنگێز؛ مێشەکەرانە.
**tabard** (tab'ērd), ***n.*** (١) جۆرە چاکەتێکی دەڵبە.
(٢) جبەیەکی قۆڵ کورتی نەخشێنراوە سوارچاکان لەسەر قەڵغانەکانیانەوە
لەبەریان دەکرد.
**tabaret** (tab'ēr-it), ***n.*** قوماشێکی ئاوریشمی میل میلە.
**Tabasco** (tə-bas'kō), ***n.*** سۆسێکی توونە.
**tabby** (tab'i), ***n.*** (١) ئاوریشمی شەپۆلدار.
(٢) پشیلەی خۆڵەمێشی میلی ڕەشدارە. (٣) پشیلەی مێ‌ی ماڵی.
(٤) گەورە کچ؛ قەیرە کچ. (٥) ئافرەتی غەیبەتچی.
***adj.*** (١) نیشانەی شەپۆلی پێوەیە. (٢) میلی ڕەشدار.
***v.t.*** نیشانەی شەپۆلی لێدان (ئاوریشم).
**tabernacle** (tab'ēr-nak'l), ***n.*** (١) (ا) لانەی سەردەمی (وەك چادر)؛
چادر؛ دەوار. (ب) خانوو؛ ماڵ؛ نشینگە.
(٢) لەشی مرۆڤ (وەك ئارامگەی ژیان). (٣) کەنیشتە؛ پەرستگای جوولەکە.
(٤) قوژبنی پەیکەر یا شتی کۆنی پیرۆز.
(٥) (ا) پەرستگای مۆرمۆنەکان. (ب) کلێسەی گەورە.
(٦) دەفری نانی پیرۆزی شێوی قوربانی (خاچ پەرستی).
***v.i.*** (١) لە لانەی سەردەمیدا ژیان؛ لە چادردا دانیشتن.
(٢) بۆ سەردەمێك مانەوە؛ تێدا نیشتەجێ بوون یا مانەوە.

-tabernacular *(adj.)*.
**tabes** (tā'bēz), ***n.*** (١) دەردە باریکە؛ سیل؛ پووکانەوە.
(٢) tabes dorsalis .
-tabetic *(adj.)*.
**tabes dorsalis,** نەخۆشی‌یەکی بڕبڕەی پشتە.
**tabla** (tab'lə), ***n.*** تەپڵ.
**tablature** (tab'lə-chēr), ***n.*** (١) نیشانەکاری‌یەکی کۆنی مۆسیقا
لێدانە بۆ دیاری کردنی ئەو پەنجەو ژێیانەی پێویستە بەکاربهێنرێن.
(٢) تەختە بەرد یا ڕوویەکی نەخش لەسەر هەڵکەنراو یا نیگار لەسەر کێشراوە.
**table** (tā'b'l), ***n.*** (١) تەختە بەرد، دار، یا ئاسن (بۆ نەخش لەسەر
هەڵکەندن). (٢) مێز؛ مێزی نان خواردن؛ خوان؛ سفرە.
(٣) مێزی ڕازاوە بە خواردەمەنی. (٤) خواردەمەنی سەر مێزێکی وەها
(٥) دانیشتووانی سەر مێزێکی وەها.
(٦) خشتە؛ لیستە: *( the multiplication ~ )* .
(٧) tableland . (٨) مێزی ئیش.
(٩) شانەی ڕەقی دیوی ناوەوەو دەرەوەی کەللەی سەر.
(١٠) stringcourse .
(١١) (ا) لایەکی تەختەی تاوڵە. (ب) [Obs.]، تاوڵە؛ نەرد.
(١٢) چین (زەمینناسی)
(١٣) (ا) ڕووی تەختی سەرەوەی بەردی بەنرخ. (ب) بەردی بەنرخی وەها.
(١٤) بەری دەست؛ بەری لەپ.
***v.t.*** (١) [Rare] ، خشتەکردن؛ لیستەکردن؛ خشتە بۆ کردن.
(٢) خستنە سەر مێز.
(٣) دواخستن (باسێك لە کۆڕ یا پەرلەماندا)؛ پاش خستن.
**on the table,** دواخراوە بۆ دوارۆژ (باسێك لە کۆڕ یا پەرلەماندا)
**turn the tables,** هەڵگێڕانەوەی باروودۆخێك بەتەواوی (لە خراپەوە بۆ
باش یا لە ژێرکەوتن و دۆڕانەوە بۆ سەرکەوتن و بردنەوە).
**tableau** (tab'lō, tab-lō'), ***n.*** (١) (ا) وێنە؛ تابلۆ.
(ب) باسێکی ڕوونی وێنە ئاسایی. (٢) باروودۆخێکی وورووژێنەرو کوتوپڕی.
(٣) tableau vivant .
**tableau vivant** (tå'blō' vē'vän'), [Fr.], خۆنووانەنێکی
بێ جووڵەی سەر شانۆیە بە جلی ڕازاوەوە.
**table-cloth** (tā'b'l-klôth'), ***n.*** سەرمێز؛ سفرە.
**table d'hôte** (tä'b'l dōt'), (١) مێزی نان خواردنی ئوتێل یا
چێشتخانە. (٢) خۆراکی ڕۆژانەی ئوتێل یا چێشتخانە بە نرخێکی تایبەتی
**tableland** (tā'b'l-land'), ***n.*** دەشتی بەرزو بەر بەرەڵا.
**table linen,** سەرمێزو دەستەسڕی کاغەز.
**table salt,** خوێی سەرمێز؛ خوێی چێشت؛ خوێ.
**table-spoon** (tā'b'l-spōōn', tā'b'l-spoon'), ***n.*** (١) کەوچك؛
کەوچکی چێشت. (٢) پڕ کەوچکێکی چێشت.
**table-spoonful** (tā'b'l-spōōn'fool, tā'b'l-spoon-fool'), ***n.*** پڕ کەوچکێکی چێشت.
**tablet** (tab'lit), ***n.*** (١) تەختە بەرد، دار، یا ئاسن.
(٢) تەختە بەرد، دار، یا ئاسنی شت لەسەر هەڵکەنراوو هەڵواسراو.
(٣) پەڕەی تەنکی کانزا، سەدەف، یا دار بۆ لەسەر نووسین.
(٤) دەستەیەك لەم پەڕانە. (٥) تیانووس؛ پەڕاو؛ دەفتەر.
(٦) قاڵب (سابوون و شتی وەها).
(٧) حەب؛ دەنکە دەرمان: *( an aspirin ~ )* .
**table talk,** گفتوگۆی سەر نان خواردن.
**table tennis,** تێنسی سەرمێز؛ پینگ پۆنگ.
(هەروەها: " ping-pong " ).
**tableware** (tā'b'l-wâr'), ***n.*** پێویستی سەر مێزی نان خواردن
(کەوچك و چنگاڵ و قاپ)؛ قاپ‌وقاچاخ.
**table wine,** مەی سەر مێزی نان خواردن؛ ئەو جۆرە شەرابەیە کە لەگەڵ
خواردندا بخورێتەوە (کە پلەی کحوولەکەی کەمە).

**tabloid** (tab′loid), *n.* (١) حەب؛ دەنکە دەرمان.
(٢) ڕۆژنامەیەکی بچووکی پڕ لە وێنەو دەنگوباسی وورووژێنەر.
*adj.* کورت؛ کورتکراوە
**taboo** (tə-bōō′, ta-bōō′), *n.* (١) قەدەغەکردن لەبەر پیرۆزی یا خراپی
(کار، شت، کردەوە، خەڵك)؛ حەرام کردن.
(٢) شت یا کاری قەدەغەکراو؛ شتی پیرۆز یا خراپی حەرام کراو.
(٣) قەدەغەکاری (بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی).
*adj.* (١) قەدەغەکراو (لەبەر پیرۆزی یا خراپی)؛ حەرام؛ حەرام کراو.
(٢) قەدەغە بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی.
*v.t.* (١) قەدەغەکردن (لەبەر پیرۆزی یا خراپی)
(٢) قەدەغەکردن بەپێی نەریتی کۆمەڵایەتی.
**tabor** (tā′bẽr), *n.* تەپڵی بچووك
*v.i.* تەپڵی بچووك لێدان
**taboret** (tab′ə-rit, tab′ə-ret′), *n.* (١) تەپڵی بچووك
(٢) کورسی بێ پشت؛ ئەسکەملی. (٣) تەپڵەکێکی جوان.
(٤) چواچێوەی نەقشکاری
**tabour** (tā′bẽr), *n. & v.i.* = tabor.
**tabouret** (tab′ə-ret′, tab′ẽr-it), *n.* = taboret.
**tabret** (tab′rit), *n.* (١) تەپڵی بچووك
(٢) [Obs.]. تەپڵچی؛ تەپڵی بچووك لێدەر.
**tabular** (tab′yoo-lẽr), *adj.* (١) ڕوو تەخت؛ تەخت: *( ~ rock)* .
(٢) (ا) خشتەکراو؛ ڕێکخراو لە شێوەی خشتەدا.
(ب) بە خشتە ژمێردراوە یا لێکدراوەتەوە.
**tabula rasa** (tab′ū-lə rā′sə), [L.], (١) تەختە بەرد، دار، یا
کانزای هیچ لەسەر هەڵنەکەنراو؛ تەختەی ڕووت یا پاك
(٢) مێشکی ساف وەك هی منداڵ (کە هێشتا هیچی تێدا نییە).
**tabulate** (tab′yoo-lāt′), *v.t.* (١) ژماردن؛ لێکدانەوە
(٢) ساف کردن؛ تەخت کردن.
*adj.* (١) ڕووتەخت؛ تەخت. (٢) لە پەڕە یا تەبەقی تەنكو ئاسۆیی پێکهاتوو.
-tabulation *(n.)*.
**tabulator** (tab′yoo-lā′tẽr), *n.* (١) ژمێریار
(٢) پێژمێر؛ ئامێری ژماردن.
(٣) ئامێری خانەکردن یا خشتەکردنی ژمارە لە چاپکەردا.
**tacamahac** (tak′ə-mə-hak′), *n.* (١) جەوییەکی بۆن تیژە
(لە مەڵحەمو بخووردا بەکاردێت). (٢) دارێکە وەك چنار یا سپیدار (ئەم جۆرە
جەوییە دەردەدات)
**tachometer** (tə-kom′ə-tẽr), *n.* تاکۆمەتر: پێوەری خێرایی
خولانەوە.
-tachometric *(adj.)*; tachometry *(n.)*.
**tachy-** (tak′i), پێشگرێکە بەمانای خێرا *( tachymeter)* .
**tachycardia** (tak′i-kär′di-ə), *n.* دڵەکوتێ
**tachygraphy** (ta-kig′rə-fi), *n.* کورتەنووسی بەتایبەتی هی
یۆنانو ڕۆمانەکان)
**tachylyte, tachylite** (tak′i-līt′), *n.* تاکلیت: جۆرێکە لە بازۆڵتی
شووشەیی ڕەش
**tachymeter** (ta-kim′ə-tẽr, tə-kim′ə-tẽr), *n.* ئامێری ڕووپێوی
خێرای دووریو بەرزی.
-tachymetry *(n.)*.
**tacit** (tas′it), *adj.* (١) بێ دەنگ
(٢) نەوورتراو؛ نەدرکێنراو بەڵام وا ڕاگەیێنراو:
*( ~ consent, aggrement, approval, etc.)*
**taciturn** (tas′ə-tũrn′), *adj.* نەدوو؛ کەم دوو؛ قسەنەکەر؛
هەمیشە بێ دەنگ.
-taciturnity *(n.)*; taciturnly *(adv.)*.
**tack** (tak), *n.* (١) بزماری کورتی سەرپان.
(٢) (ا) تەقەڵ (بەتایبەتی هی درێژو سەردەمی).
(ب) لێکدان؛ پێکەوە نووسانی سەردەمی. (٣) ڕێگەی پێچاوپێچ.
(٤) ڕێبازی نوێ؛ ڕێبازی جیا لە ڕابوردوو. (٥) خواردەمەنی؛ خۆراك
(٦) (ا) پەتی دابەستنی چمکی بایەوان. (ب) ئەم چمکە دابەستراوە.
(٧) (ا) ڕێبازی کەشتی. (ب) گۆڕینی ڕێبازی کەشتی.
(ج) بەرەو ڕووی با ڕۆیشتنی کەشتی. (د) ڕۆیشتنی پێچاوپێچی کەشتی.
*v.t.* (١) پێوە نووساندن بە بزماری کورتی سەرپان.
(٢) پێکەوە دوورینەوە؛ لێکدان بە تەقەڵی زلو سەردەمی.
(٣) خستنە سەر (پاشکۆ)؛ بۆ زیادکردن؛ پێوەنان:
*( ~ an amendment to the bill)*
(٤) (ا) گۆڕینی ڕێبازی کەشتی بەرەو با.
(ب) مناوەرە پێکردنی کەشتی لە ڕاندندا بەرەو با.
*v.i.* (١) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن.
(٢) ڕێباز گۆڕین لەپڕ؛ لەپڕ هەڵوێست گۆڕینو ڕێگەی تازە گرتنەبەر.
(٣) گۆڕینی ڕێگەی کەشتی.
**tackle** (tak′′l), *n.* (١) کەرەسە (ئامێر): *( fishing ~ )* .
(٢) گوریسو خولخولۆکە (بۆ بەرزکردنەوەو هێنانە خوارەوەی شت).
(٣) بەرەنگاربوونو وەستانی یاریکەری بەرامبەر (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
(٤) ئەم یاریکەرە. (٥) گوریسی بایەوانو دارکەشتی.
*v.t.* (١) زینکردن. (٢) گرتن؛ بە دەست گرتن.
(٣) چارەسەرکردن؛ هەوڵی چارەکردن دان؛ خەریکی چارەکردن بوون؛ کردن:
*( to ~ a problem, job, etc.)*
(٤) بەرەنگاربوونو وەستاندنی تۆپ (فوتبۆڵی ئەمەریکی).
*v.i.* بەرەنگاربوونو وەستاندنی تۆپی بە دەستی تیپی بەرامبەرەوە.
**tacky** (tak′i), *adj.* لینج؛ سرێشاوی.
-tackiness *(n.)*.
**tacky** (tak′i), *adj.* [Colloq.], (١) پەڕپووت؛ کۆنە؛ پیسوپۆخڵ.
(٢) ناشرین (کردەوە، ڕەووشت)؛ نابەجێ؛ هیچوپووچ.
(٣) زەق؛ بریقەدارو هەرزان بەها.
-tackiness *(n.)*.
**taco** (ta′kō), *n.* تاکۆ: جۆرە ساندویچێکە بریتییە لە نانی ڕەقی ئاخنراو
بە شتی وەك گۆشتی قیمە یا پەنیر... هتد.
**taconite** (tak′ə-nīt′), *n.* تاکۆنیت: بەردی ئاسن؛ ئاسنی خاو.
**tact** (takt), *n.* (١) هەستی بەرکەوتن؛ هەستی دەست لێدان.
(٢) سەلیقە؛ هەستو هۆشی کۆمەڵایەتی ڕاست؛ لێهاتوویی لە کاروباری
کۆمەڵایەتیو دیبلۆماسیدا؛ چارەکردنی گیروگرفت بە جوانیو ژیری
بێ زویرکردنی کەس: *( An ambassador must have great ~ .)* .
**tactful** (takt′fəl), *adj.* بە سەلیقە؛ گیروگرفت چارەکەر بە جوانیو
ئاسکیو ڕێكوپێکی: *( a ~ reply; a ~ person)* .
-tactfully *(adv.)*; tactfulness *(n.)*.
**tactic** (tak′tik), *n.* تەکتیك.
*adj.* = tactical.
**tactical** (tak′ti-k′l), *adj.* (١) تەکتیکی؛ تایبەتی بە تەکتیکی سوپایی.
(٢) تەکتیکزان؛ بە تەکتیك.
-tactically *(adv.)*.
**tactician** (tak-tish′ən), *n.* (١) تەکتیکزان؛ بە تەکتیك؛
شارەزای تەکتیکی جەنگ. (٢) بەڕێوەبەری لێهاتوو.
**tactics** (tak′tiks), *n.pl.* (١) تەکتیکی جەنگزانی؛ هونەری تەکتیکی
جەنگ. (٢) ڕێگە (بۆ هێنانەدی مەبەستێك)؛ پێی لێهاتووانە.
**tactile** (tak′t′l, tak′til), *adj.* (١) هەستپێکراو؛ دەست بەرکەوتوو؛
دەست لێ گیربوو. (٢) تایبەتی بە هەستی دەست لێدان؛ تایبەتی بە هەستی
بەرکەوتن.
-tactility *(n.)*.
**taction** (tak′shən), *n.* بەرکەوتن؛ دەست لێدان.
**tactless** (takt′lis), *adj.* بێ سەلیقە؛ نەزان (نەریتی کۆمەڵایەتیو

ڕەفتار نوواندن: ***( a ~ reply; a ~ person)*** .

**tactual** (tak′chōō-əl), *adj.* تایبەتی بە هەستی دەست لێدان یا بەرکەوتن

**tad** (tad), *n.* منداڵ؛ کوڕ

**tad** (tad), *n.* ئەختێك؛ تۆزێك

***( She looked a ~ bigger than him.)***

**tadpole** (tad′pōl′), *n.* سەرمێکوتە.

**tad** (tad), *n.* (١) کێشانەیەکی بچووکی چینییە. (٢) پارەیەکی چینییە.

**taenia** (tē′ni-ə), *n.* (١) سەرپێچ.

(٢) ئیلماسکی شریتی لەش (توێکاری). (٣) تیرە (خانووسازی).

(٤) کرمی شریتی

**taeniacide** (tē′ni-ə-sīd′), *n.* کرمی شریتی کوژ (دەرمان).

**taeniasis** (ti-nī′ə-sis), *n.* نەخۆشی کرمی شریتی.

**taffarel, tafferel** (taf′ə-rel′, taf′ēr-əl), *n.* (١) لاسەرووری پشتی کەشتی. (٢) **taffrail** .

**taffeta** (taf′i-tə), *n.* تافتە: قوماشێکی ئاوریشمییە (بۆ جلی ژنانە).

**taffrail** (taf′rāl′), *n.* ئەردەی پشتی کەشتی.

**taffy** (taf′i), *n.* (١) جۆرە جیقلاتەیەکە.

(٢) مەرایی؛ زمان لووسی.

**tafia** (taf′i-ə), *n.* خواردنەوەیەکی مەستکەرە.

**tag** (tag), *n.* (١) چمکە جلێکی دڕاوی شۆڕبووەوە. (٢) چمکی شۆڕبووەوە.

(٣) سووکی قەیتانی پێڵاو.

(٤) پارچە پەڕۆیەکی ڕەنگینە بە داری ڕاوەماسییەوە.

(٥) نیشانە (کە دەنرێ بە فرۆتەنییەکەوە نرخ و قەبارەو شتی وەهای تێدا دەنووسرێت؛ کارتی ناوو ناونیشان و ناوەڕۆك (کە لە شتێك دەدرێ).

(٦) کۆتایی ڕەنگینی ووتار یا چیرۆك.

(٧) پەندێکی کورتە لە کۆتایی وەهادا بەکاردەهێنرێت.

(٨) دوا ووشەکانی گۆرانییەك یا ووتەی نوێنەرێك.

(٩) دوا بەش؛ کۆتایی؛ دوادوایی.

(١٠) قوڵفە (بە جلێکەوە بۆ هەڵواسینی یا بە جزمەوە بۆ هەڵکێشانی).

(١١) نووسینی ڕازاوە.

(١٢) (ا) کاکۆڵ؛ پرچی لوول؛ تیتك؛ گیسوو.

(ب) تۆپەڵە بەرگن یا خوری لوول و لەیەك ئاڵاو.

(١٣) [Obs.]، جەماوەری ڕەش و ڕووت.

(١٤) یارییەکی منداڵانەیە لە چاوشارکێ دەچێت بەبێ چاو بەستنەوە:

***( to play ~ )***

***v.t.*** (١) نیشانەکردن؛ کارتی ناوو ناونیشان و ناوەڕۆك لێدان.

(٢) کۆتایی پێ هێنانی ووتارێك بە ووتەیەکی ڕەنگین.

(٣) گرتنەوە یا دەست لێدان (لە یاری منداڵانی وەك چاوشارکێدا).

(٤) [Colloq.]، خۆ پێدا هەڵواسین؛ دواکەوتن و لە کۆڵ نەبوونەوە.

***v.i.* ( ~ along)**, [Colloq.], خۆ پێدا هەڵواسین؛ شوێن کەوتن و لە کۆڵ نەبوونەوە.

**tagalong** (tä-gä′loŋg), *n.* خۆهەڵواس.

**tag along**, [Colloq.], خۆ هەڵواسین؛ شوێن کەوتن و لێ نەبوونەوە؛ هەمیشە لەگەڵدا بوون یا بوون بە پاشکۆ.

**tag day**, ڕۆژی پیتاك کۆکردنەوەو کارت دان بە پارەدەرەکان.

**tag end**, (١) چمکی شۆڕبووەوە؛ کلك.

(٢) کۆتایی؛ دوا شت.

**taiga** (tī′gə), *n.* دارستانی کاج.

**tail** (tāl), *n.* (١) کلك. (٢) کلکە ئەسپ (کە لە بەردەمی پاشاوە هەڵدەگیرا).

(٣) کلکی ئەستێرەی کشاو.

(٤) دووگ؛ قنگ؛ کلێنچکە؛ پشتەوە؛ پاشبەند.

(٥) (*pl.*)، خەت (شێرو خەت): ***( heads or ~s)***

(٦) پرچی هۆنراوەی درێژ.

(٧) (ا) ریزە خەڵکی چاوەڕوانکەر (ب) دەستوپێوەند.

(٨) (*pl.*) (ا) [Colloq.]، چاکەتی کلك پەڕەسێلکەیی، واتە دووفلیقانە

(ب) جلی ڕەسمی پیاوانەی شەو.

(٩) دامێنی جۆگە یا ئەستێرك. (١٠) پشتی فڕۆکە؛ کلکی فڕۆکە.

(١١) دامێنی پەڕە. (١٢) دوا دێڕی کورتی بڕگەیەکی هەڵبەست.

(١٣) [Colloq.]، شوێن پێ: ***( The hounds were on his ~ .)*** .

(١٤) [Colloq.]، سووسە؛ سیخوڕ (کە دوای کەسێك کەوتبێ).

(١٥) [Vulgar Slang]، ئافرەت؛ ژن.

***v.t.*** (١) کلك بۆ کردن: ***( to ~ a kite)*** .

(٢) کلك بڕین؛ کلك قرتاندن.

(٣) لە دوایەوە ڕۆیشتن؛ بە دوادا هاتن.

(٤) لێکدان؛ پێکەوەبەستن: ***( ~ two ideas together)*** .

(٥) سەری نێرگە یا خشت خستنە دیوارەوە.

(٦) شوێن کەوتن (سووسە)؛ دواکەوتن (بۆ چاودێری).

***v.i.*** (١) ( **~ out** )، بلاوەپێکردن. (٢) سەر خرانە ناو دیوارەوە

(٣) [Colloq.]، دواکەوتن؛ لە دواوە چوون یا هاتن.

(٤) (ا) لە زەوی دان بە پشتدا (کەشتی، بەلەم).

(ب) ڕووکردنە شوێنێك (کەشتی).

***adj.*** (١) لە دواوە؛ لە پشتەوە. (٢) لە دواوە هاتوو: ***( a ~ wind)*** .

**turn tail**, ڕاکردن (لە ترسدا).

**with the tail between the legs**, بە بەزیوی؛ بە شکاوی؛ بە ترسەوە.

**tail** (tāl), *n.* دانان یا دیاریکردنی میراتییەك بۆ چەند نەوە یا میراتبەرێك و هیچ کەسی تر

**tailboard** (tāl′bôrd′, tāl′bōrd′), *n.* دەرگای دواوەی گالیسکەی بار یا پیکاب (کە لادەبرێ یا دادەگیرێ بۆ بارکردن و داگرتن)

**tail coat**, چاکەتی کلك پەڕەسێلکەیی، واتە دووفلیقانەی شەو.

**tail dive**, کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە بە قنگدا.

**tail end**, (١) کەفەل؛ قنگ. (٢) دوا بەش؛ بەشی هەرە دوا؛ پاشبەند؛ بنکڕ (مەجاز). (٣) کۆتایی.

**tail-gate** (tāl′gāt′), *n.* = **tailboard.**

***v.t.*** شوێنی ئوتومبیلێکی تر کەوتن زۆر لە نزیکەوە: ***( to ~ someone)*** .

***v.i.*** ئوتومبیل لێخوڕین بەم جۆرە.

**tailing** (tāl′iŋ), *n.* (١) سەرکۆزەر؛ گەندە

(٢) ئەو بەشەی خشتێکی دەرپۆقیوە کە لەناو دیواردا جێگیر بووە.

**tail lamp**, = **tail-light.**

**taille** (tāl), *n.* (١) سەرانەی پاشا یا دەرەبەگی فەرەنسای کۆن.

(٢) کەمەری کراس؛ چۆنیەتی بە بەرکردنی کراس.

**tail-light** (tāl′līt′), *n.* چرای پشتی ئوتومبیل.

(هەروەها: " **tail lamp** ").

**tailor** (tā′lēr), *n.* جلدروو؛ بەرگدروو.

***v.i.*** بەرگدروویتی کردن؛ جل دوورین.

***v.t.*** (١) جل دوورین؛ بەرگ دروون.

(٢) جلی دەستکرد بە بەرگرتن؛ جل بۆ کردن.

(٣) دروستکردن یا گونجاندن بەپێی پێویستی و مەبەستی تایبەتی؛ بە تایبەتی کردن:

***( a speech ~ed to a special audience. She ~s her novels to popular tastes.)***

**tailor-bird** (tā′lēr-bûrd′), *n.* مەلە جلدروو: مەلێکی بچووکە گەڵا دەدوورێت پێکەوە بە ڕیشاڵ و هێلانەی لێ درووست دەکات.

**tailoring** (tā′lēr-iŋ), *n.* (١) (ا) جلدرووێتی؛ پیشەی بەرگدروو.

(ب) کارامەیی جلدروو. (٢) درووستکردن و گونجاندنی شتێك بەگوێرەی پێویستی و مەبەستێکی تایبەتی.

**tailor-made** (tā′lēr-mād′), *adj.* (١) دەستدروو؛ دەستکرد: ***( a ~ suit)***

(٢) جوان دووراو؛ جوان و شۆخ (جلی ژنانە).

(٣) بۆ مەبەستێك یا پێویستییەکی تایبەتی درووستکراو؛ دەستکرد:

***( a ~ house, bed, chair, job, etc.)***

**tailor's chalk,** سابوون یا گەچی جلدروو (بۆ جل نیشانەکردن)

**tail-piece** (tāl′pēs´), *n.* (١) پاشبەند؛ پاشکۆ؛ کلك؛ دوابەش.

(٢) ژێبەند پارچەیەك تەختەداری سێگۆشەی بچووکە لە لای خوارووی ئامێری وەك کەمانچەوە سەری ژێکانی پێوە دەبەسترێتەوە.

(٣) دەستەکێکە سەرێکی لەناو دیواردا بێت.

(٤) نەخش و نیگاری بچووکی کۆتایی بەندێکی پەرتووك.

**tail pipe,** بۆری سەکۆزسی ئوتومبیل.

**tail plane,** لەنگەری فڕۆکە (کە بە پشتەکەیەوەیەتی).

**tail-race** (tāl′rās´), *n.* (١) لا خوارووی جۆگەی ئاوی ئاش.

(٢) ئاوەڕۆی ئاوی ئاش. (٣) جۆگەی خڵتەو پاشماوەی کانگا.

**tail-spin** (tāl′spin´), *n.* (١) کەوتنە خوارەوەی فڕۆکە بەسەرەوار

بە کلك خولانەوە (٢) وورە بەردان؛ ڕووخان (دەروون)؛ پشێوی؛ شپرزەیی.

**tail wind,** پشتە با: بایەکە کە لە دوای فڕۆکەو کەشتییەوە هەڵدەکات

**tain** (tān), *n.* (١) پەڕەکی تەنەکە.

(٢) پەڕەکی تەنەکەی لە پشتی ئاوێنە دراو.

**taint** (tānt), *v.t.* (١) لەکەدار کردن؛ ناو پیس کردن؛ بەدناو کردن

***( Her reputation was forever ~ed.)***

(٢) تێکدان؛ پیس کردن؛ خراپ کردن. ***( Greed ~ed his mind.)*** .

(٣) تووشی نەخۆشی کردن.

(٤) [Obs.] ، ڕەنگ کردن؛ ڕەنگ لێدان.

***v.i.*** ڕەنگ تێکچوون؛ خراپ بوون؛ پیس بوون؛ تێکچوون.

***n.*** (١) لەکە؛ پیسی؛ ناوپیسی.

(٢) سەرچاوەی پیسی؛ هۆی خراپی؛ میکرۆب (مەجاز)

(٣) [Obs.] ، ڕەنگ

**take** (tāk), *v.t.* (١) گرتن؛ داگیرکردن: ***( ~ an enemy fortress)*** .

(٢) گرتن بە تەڵە؛ بە تەڵەوە کردن؛ ڕاوکردن.

(٣) گرتن (داشی شەترەنج)؛ بردنەوە: ***( to ~ your oponent's queen)*** .

(٤) دەست بە سەردا گرتن؛ زەوت کردن؛ لێ سەندن

(٥) گرتنەوە (تۆپ لە یاریدا)

(٦) گرتن بە دەست؛ گرتن: ***( T~ your oponent's hand.)*** .

(٧) گرتن (نەخۆشی)؛ تووش بوون: ***( He took a cold.)***

(٨) هاتن بە سەردا لەپڕ؛ گرتن. ***( They'll never ~ him unawares.)*** .

(٩) لێدان؛ پیادان؛ پیاکێشان

(١٠) دڵفڕاندن؛ دڵ ڕاکێشان: ***( He was completely taken by her.)*** .

(١١) خواردن؛ خواردنەوە؛ هەناسە هەڵکێشان: ***( T~ a deep breath. She hasn't taken any food in days.)***

(١٢) لەش دانە بەر؛ وەرگرتن؛ خستنە بەر: ***( T~ some sun.)*** .

(١٣) وەرگرتن؛ هێنانە ناو؛ هێنان:

***( to ~ a new partner into the firm)***

(١٤) جووت بوون لەگەڵ؛ گاین. ***( Abraham took his slave girl.)*** .

(١٥) گرتنەخۆو سەرپەرشتی کردن یا بەخێوکردن.

(١٦) کڕین ***( We always ~ season tickets.)*** .

(١٧) (ا) گرتنە ئەستۆی خۆ: ***( I'll ~ the blame.)*** .

(ب) چوونە ژێر؛ گرتنە ئەستۆ؛ پێ هەڵسان:

***( He took chairmanship of the committee.)***

(ج) بەڵێندار؛ پەیماندان.

(د) بردن (کات)؛ پێچوون:

***( He took extra time to do the job properly.)***

(هـ) وەرگرتن؛ قبووڵکردن؛ کردن بە هی خۆ.

(و) پێویست بوون؛ ویستن؛ وەرگرتن:

***( Intransitive verbs ~ no direct object.)***

(١٨) بردنەوە؛ بردن ***( Our candidate took forty states.)*** .

(١٩) بەزاندن؛ لێ بردنەوە: ***( Our team took theirs four to one.)*** .

(٢٠) (ا) هەڵبژاردن؛ هەڵگرتن. ***( T~ any card.)***

(ب) بەکارهێنان (ئامێر)

(ج) بە کرێ گرتن؛ گرتن: ***( T~ a taxi.)*** .

(د) پەنا بردنە بەر؛ بەکارهێنان؛ چوونە ناو:

***( T~ shelter in the event of an air raid.)***

(٢١) گرتن؛ تێدا دانیشتن: ***( T~ a seat.)***

(٢٢) تێچوون؛ پێویست کردن: ***( It ~s money to live in that town.)***

(٢٣) بۆ مانەوە؛ لێوە وەرگرتن:

***( She took her shyness from her mother.)***

(٢٤) وەرگرتن (لە سەرچاوەیەکەوە).

(٢٥) (ا) نووسین؛ خستنە سەر کاغەز: ***( T~ a letter.)*** .

(ب) گرتن: ***( T~ a picture of us.)*** .

(٢٦) (ا) دەربردن؛ وەرگرتن؛ قبووڵکردن:

***( He can't ~ criticism. I can't ~ it any more.)***

(ب) بەرگەگرتن؛ بەرهەڵستی کردن:

***( The dam took the heavy flood waters.)***

(ج) بڕواکردن: ***( I'll ~ your word.)*** .

(د) لەسەر ڕۆیشتن؛ پەیڕەوی کردن.

(هـ) وەرگرتن؛ گرتن:

***( to ~ something lightly; He ~s things in stride.)***

(٢٧) کردن: ***( T~ a bath, walk, etc.)*** .

(٢٨) (ا) ڕێ پێدان؛ لێوە هاتنە ژوورەوە:

***( The boat took in a lot of water but remained afloat.)***

(ب) جێ کردنەوە؛ گرتن؛ جێ تێدا بوونەوە:

***( We can't ~ more than twenty guests.)***

(ج) گرتن (ڕەنگ).

(٢٩) (ا) وا تێگەیشتن؛ وا لێکدانەوە؛ وا دانان:

***( She took my silence for disapporval.)***

(ب) وا دانان؛ بەوە دانان: ***( They took him for a fool.)*** .

(ج) بە ئەوەندە دانان.

(د) هەستکردن: ***( I ~ pleasure to inform you.)*** .

(٣٠) بردن؛ هێنان: ***( Don't forget to ~ your umbrella.)***

(٣١) بردن: ***( This bus ~s you past the museum.)*** .

(٣٢) لابردن: ***( T~ these dishes from here.)*** .

(٣٣) دەرهێنان: ***( The dentist took two molars.)*** .

(٣٤) فەوتاندن؛ کوشتن: ***( The forest took these plants.)***

(٣٥) لێ دەکردن (ژمارەوپێوان).

(٣٦) وەرگرتن؛ خوێندن: ***( T~ a biology course.)*** .

(٣٧) خەڵەتاندن؛ دەستبڕین؛ گزی کردن؛ فێڵ کردن: ***( You were taken.)***

(٣٨) خایاندن؛ پێچوون؛ بردن (کات): ***( The trip will ~ two hours.)*** .

***v.i.*** (١) سەندن؛ وەرگرتن؛ بردن؛ بوون بە خاوەن.

(٢) لەیەك گیربوون (ددانی زنجیر یا پێچکە).

(٣) ڕەگ داکوتان؛ ڕووان؛ سەوزبوون: ***( Have the seeds taken?)*** .

(٤) گرتن (ئاگر): ***( The fire took rapidly.)*** .

(٥) سەرکەوتن؛ گرتن؛ کاریگەربوون؛ باش بوون:

***( The smallpox vaccination took. The dye ~s well.)***

(٦) بە دڵی خەڵك بوون؛ سەرکەوتوو بوون؛ پەسەند کران:

***( The movie never took with the public.)***

(٧) ( from ~ )، لێ کەم کردنەوە؛ زیان پێ گەیاندن:

***( The rumors ~ from his public image.)***

(٨) وا لێ هاتن؛ بوون؛ نەخۆش کەوتن: ***( He took sick.)*** .

(٩) چوون؛ بۆ چوون؛ چوون بەرەو: ***( I took to the open road.)*** .

***n.*** (١) (ا) وەرگرتن؛ گرتن؛ سەندن؛ بردن. (ب) شتی وەرگیراو یا براو.

(٢) ژمارەی نێچیری ڕاوکراو بە یەك جار (وەك مەل و ماسی و گیانداری چوارپێ):

***( the day's ~ of fish)***

(٣) دەسکەوت (بەتایبەتی لە بازرگانییەك)؛ قازانج.

(٤) [Slang]، سەرجەمی دەرگانە یا پارەی بلیتی یارییەك.

(٥) (ا) پەردەیەکی فیلم کە بگیرێ بەبێ وەستانی کامێراکە.
(ب) وەرگرتنی ئەم پەردەیە.
(٦) [Slang]، هەوڵ؛ جار: *( He got the answer on the third ~ .)* .
**take aback,** سەرسوڕمان: حەپەسان؛ واق ووڕمان.
**take a back seat,** دەوری ناگرنگ بینین؛
ڕێگەدان بە خەڵکی تر بۆ پێشڕەوی کردن.
**take advantage of,** (١) هەل هێنان؛ سوود لێ وەرگرتن.
(٢) بەکارهێنان بۆ سوود یا ئامانجی خۆ؛ سوودی ناڕەوا لێ وەرگرتن؛
بەکارهێنان
*( to take advantage of somebody when he is down)*
**take after,** (١) چاولێکردن.
(٢) لێچوون؛ لێکردن (بە شێوە یا بە کردەوە)؛ چوونەوە سەر:
*( He takes after his father.)*
**take amiss,** (١) بەهەڵەداچوون؛ هەڵەکردن.
(٢) بە هەڵە تێگەیشتن و زویر بوون یا پێ ناخۆش بوون.
**take apart,** (١) هەڵوەشاندنەوە؛ هەڵوەشان؛ لێك جیاکردنەوە.
(٢) لێکۆڵینەوە بە وردی (بەتایبەتی بۆ کەموکوڕی دەرخستن).
(٣) [Colloq.]، شڕو وڕ کردن؛ بیرازکردن؛ زۆر بە توندوتیژی لەگەڵدا
جوڵانەوە
**take at one's word,** بڕواپێکردن
**take back,** (١) وەرگرتنەوە؛ سەندنەوە؛ بردنەوە.
(٢) پاشگەزبوونەوە؛ کێشانەوە.
**take care,** وریا بوون؛ ئاگا لە خۆ بوون.
**take care of,** چاودێری کردن؛ ئاگا لێ بوون؛ بەخێوکردن؛
سەرپەرشتی کردن.
**take charge,** گرتنە ئەستۆی خۆ؛ گرتنە ژێر دەستی خۆ؛ گرتنەدەست.
**take down,** (١) داگرتن: هێنانە خوارەوە. (٢) (ا) بڕینەوە (دارو درەخت).
(ب) ڕووخاندن. (ج) هەڵوەشاندن؛ هەڵوەشاندنەوە؛ لێك کردنەوە.
(٣) دامالین. (٤) لە لووت دان؛ شکاندن.
(٥) تۆمارکردن؛ نووسین؛ نووسینەوە؛ خستنە سەر کاغەز.
**take effect,** (١) کارپێکردن؛ خرانە کار:
*( The salary increase takes effect next month.)*
(٢) ئەنجام بوون؛ ئەنجام دەرکەوتن.
**take five ( or ten ),** پشوویەکی کورت دان (بۆ پێنج یا دە خولەك).
**take for,** (١) بەوە دانان؛ وا سەیرکردن:
*( They took him for a fool.)*
(٢) وا زانین بە هەڵە؛ بە هەڵە وا دانان.
(٣) [Slang]، گزی لێکردن؛ لێ کێشانەوە.
**take (someone) for a ride, [Slang],** (١) فڕاندن و کوشتن.
(٢) دەستبڕین؛ ساختەلێکردن؛ گزی لێکردن؛ فێڵ لێکردن.
**take for granted,** (١) بە ڕاست و درووست دانان.
(٢) نرخ نەزانین؛ بە هیچ دانان؛ بایەخ پێ نەدان.
**take in,** (١) وەرگرتن. (٢) هەڵکردن (بایەوانی بەلەم و کەشتی).
(٣) کورت کردنەوە (جل وبەرگ). (٤) گرتنەوە؛ هێنانە ناوخۆوە.
(٥) تێگەیشتن. (٦) گزی کردن؛ فێڵ کردن؛ دەستبڕین.
(٧) سەرلێدان؛ چوون (گەشت)؛ بینین: *( We took in all the sights.)* .
**take in vain,** سوێند بە درۆ خواردن (بەتایبەتی بە خودا).
**take it,** (١) وا زانین: بڕوا وا بوون؛ وا دانان.
(٢) [Colloq.]، دەربردن؛ خۆڕاگرتن (لەبەر ڕەخنەو ناخۆشیدا)؛ بەرگەگرتن.
**take it lying down, [Colloq.],** بەرهەڵستی نەکردن؛
خۆ دان بە دەستەوە بەبێ هیچ بەرهەڵستییەك.
**take it on the chin, [Slang],** بەزین؛ ناخۆشی چەشتن.
**take it out on, [Colloq.],** داخی یەکێك یا شتێك بە یەکێکی تر ڕشتن؛
داخی دڵی خۆ پێ ڕشتن.
**take off,** (١) داکەندن؛ لەبەر داکەندن.
(٢) ڕۆیشتن؛ چوون؛ دەست بە گەشت کردن. (٣) لێ دەرکردن؛ لێ داشکاندن
(٤) لێکردنەوە (قورسایی)؛ داگرتن. (٥) کوشتن؛ لەناوبردن.
(٦) وێنە لەبەرگرتنەوە یا دەرهێنان.
(٧) هەڵسان (فڕۆکە)؛ فڕین:
*( The airplane will take off in ten minutes.)*
(٨) [Colloq.]، دەستپێکردن.
(٩) [Colloq.]، لاسایی کردنەوە لەسەر شانۆ.
**take on,** (١) وا لێ هاتن؛ وەرگرتن (شێوە، مانا، هەڵوێست):
*( The word has taken on a new meaning.)*
(٢) بە کرێ گرتن.
(٣) گرتنەدەست؛ گرتنە ئەستۆ:
*( He has taken on new responsibilities.)*
(٤) (ا) بەرامبەر وەستان؛ بەرەنگاربوون؛ دەرەقەت هاتن.
(ب) بۆڕبۆڕێن لەگەڵ کردن؛ پێشبڕکێ کردن.
**take (one's) time,** پەلە نەکردن؛ لەسەرخۆ کردن.
**take out,** (١) لێ لابردن؛ لێ دەرهێنان؛ لێکردنەوە.
(٢) دەرهێنان (ڕێ دان):
*( to take out a driver's license, a building permit, etc.)*
(٣) لێدان و لەناوبردن: *( to take out a military target)* .
(٤) [Colloq.]، بردنە دەرەوە؛ لەگەڵدا چوونە دەرەوە.
**take over,** (١) گرتنەدەست؛ دەستبەسەرداگرتن:
*( He will take over the management of the hotel.)*
(٢) داگیرکردن؛ زەوت کردن.
**take place,** ڕوودان.
**take root,** ڕەگ داکوتان؛ چەسپان.
**take to,** (١) بۆ چوون (بۆ خۆ شاردنەوە، حەوانەوە... هتد):
*( He took to the woods.)*
(٢) خوو پێوەگرتن؛ فێربوون (خوو): *( He took to drink.)* .
(٣) هۆگر بوون؛ حەزلێکردن؛ چوونە دڵەوە:
*( The two took to each other right away.)*
**take to task,** سەرزەنشتکردن؛ بە توندوتیژی لێپرسینەوە.
**take up.** (١) بەرزکردنەوە؛ هەڵبڕین.
(٢) کورتکردنەوە؛ لێگرتن (جل وبەرگی درێژ یا پان).
(٣) دانەوە (قەرز). (٤) هەڵمژین.
(٥) چاودێری کەسێك گرتنە ئەستۆی خۆ؛ گرتنە دەست.
(٦) پێ وێران (کارێك یا ئەرکێکی گران).
(٧) قسە پێ بڕین بە توورەییەوە.
(٨) تێهەڵچوونەوە؛ دەستپێکردنەوە. (٩) پێچوون؛ خایاندن.
(١٠) گرتن (جێگە)؛ داگیرکردن (جێگە):
*( The couch will take up most of the space.)*
(١١) (ا) پیشە بۆ خۆ هەڵبژاردن.
(ب) ڕشتەی خوێندن هەڵبژاردن.
**take upon ( or on ) oneself,** (١) گرتنە ئەستۆ (ئەرك، کار)؛
گرتنەدەست. (٢) دەستپێکردن.
**take up with, [Colloq.],** بوون بە دۆست؛ هۆگر بوون؛ هاودەمی کردن؛
هاوڕێیی لەگەڵ کردن.
**take-down** (tāk'doun'), *n.* (١) هەڵوەشاندن؛ لێك کردنەوە (مەکینە).
(٢) [Colloq.]، ڕیسوایی؛ ئابڕووچوون؛ شکان.
*adj.* بە ئاسانی لێك دەکرێتەوە یا هەڵدەوەشێنرێ (مەکینە).
**take-home pay,** مووچەی سافی (پاش باج لێ دەرکردن).
**take-in** (tāk'in'), *n.* [Colloq.], ساختە؛ گزی؛ هەڵخەڵەتاندن؛ فێڵ
**taken** (tā'k'n), *past participle of* **take.**
**taken aback,** واق ووڕمان؛ حەپەسان؛ سەرسووڕمان؛ هەڵ سڵەمینەوە.
**take-off** (tāk'ôf'), *n.* (١) فڕین؛ هەڵسان (فڕۆکە)؛ بازدان.
(٢) شوێنی فڕین یا هەڵسانی فڕۆکە؛ جێی لێوە بازدان.

(٣) [Colloq.]، لاسایی‌یەکی نەنتیکەی سەر شانۆ؛ لاسایی کاریکاتۆری.
**take-over** (tāk′ō′vēr), *n.* (١) گرتنەدەست؛ دەستبەسەرداگرتن.
(٢) داگیرکردن.
**taker** (tāk′ēr), *n.* وەرگر
**take-up** (tāk′up′), *n.* (١) کورتکردنەوە؛ لێگرتن (جل‌وبەرگ).
(٢) ئامێری توندکردنەوە.
**taking** (tāk′iŋ), *adj.* (١) سەرنج ڕاکێش؛ دڵفڕێن؛ جوان.
(٢) [Colloq.]، درمی؛ درم.
*n.* (١) وەرگرتن؛ بردن؛ سەندن. (٢) نێچیری ڕاوکراو یا گیراو.
(٣) [Colloq.]، ووروژان. (٤) (*pl.*) دەسکەوت؛ قازانج.
**talapoin** (tal′ə-poin′), *n.* (١) ڕوشکە سۆفی بوودی.
(٢) جۆرە مەیموونێکی بچووکە.
**talaria** (tə-lâr′i-ə), *n.* پێلاو یا قولەپێی باڵدار (ئەفسانەی یۆنانی).
**talc** (talk), *n.* تەلك: کانزایەکە بۆدرەی لێ دروست دەکرێ؛ بۆدرە؛
تۆزی بۆدرە.
*v.t.* تەلك لێدان؛ بۆدرە لێدان.
**talcose** (tal′kōs), *adj. Also* talcous, تەلکی: "تەلك" ی تێدایە؛
بۆدرەیی (ووشەی پێشوو ببینە).
**talcum** (tal′kəm), *n.* (١) talc . (٢) talcum powder .
**talcum powder,** بۆدرە.
**tale** (tāl), *n.* (١) (ا) چیرۆك؛ سەرگورشتە؛ سەرگوزەشتە
(ب) داستان. (٢) بەدگۆیی؛ قسەی خراپ؛ قاوی خراپ.
(٣) درۆ؛ درۆو دەلەسە
(٤) [Archaic]، سەرجەم؛ ژمارە:
*( The flood's ~ of dead is twenty.)*
(٥) [Obs.]، ئاخاوتن؛ قسەکردن.
**tell tales,** قاوی خراپ نانەوە؛ قاو داخستن؛ ئابڕوو بردن.
**tale-bearer** (tāl′bâr′ẽr), *n.* قاوی خراپ بڵاوکەرەوە؛ بەدگۆ؛
ئابڕووبەر
**tale-bearing** (tāl′bâr′iŋ), *adj.* بەدگۆ؛ ئابڕووبەر؛ قاوخەرەوە.
*n.* بەدگۆیی؛ ئابڕوو بردن؛ قاو خستنەوە.
**talemonger** (tāl′muŋ′gẽr), *n.* = talebearer.
**talent** (tal′ənt), *n.* (١) جۆرێکە لە یەکەی کێشان‌و پارەی کۆن.
(٢) بەهرە؛ توانای زگماکی؛ توانا؛ دانایی
(٣) بەهرەداران؛ خەڵکی بەتوانا یا بەهرەدار:
*( He encouraged young ~ .)*
(٤) [Slang]، قومارچی‌یان؛ گرەوکەران.
**talented** (tal′ən-tid), *adj.* بەهرەوەر؛ بەهرەدار؛ بە بەهرە
**talent scout,** بەهرەدار دۆزەرەوە: کەسێکە خەڵکی بەهرەدار دەدۆزێتەوە
بۆ شانۆو وەرزش‌و جۆرەها پیشە
**talent show,** خۆ نواندنێکی بەهرەدارانی تازەیە بۆ هەڵبژاردنی
باشترینیان (لە گۆرانی بێژی‌و نواندندا).
**taler** (tä′lẽr), *n.* جۆرە پارەیەکی زیوی ئەڵمانی کۆنە.
**tales** (tā′lēz), *n.pl.* (١) خەڵکی بانگ کراو بۆ پڕکردنەوەی جێی بەتاڵی
دەستەی سوێندخۆران (دادگەری). (٢) بانگ کردنی خەڵك بۆ ئەم مەبەستە.
**talesman** (tālz′mən, tā′liz-mən), *n.* سوێندخۆری بڕیکار:
کەسێکە دەخرێتە سەر دەستەی سوێندخۆران بۆ تەواوکردنی ژمارەی دەستەکە.
**tale-teller** (tāl′tel′ẽr), *n.* (١) story-teller .
(٢) tale-bearer .
**tali** (tä′li), *plural of* talus.
**talion** (tal′i-ən), *n.* سزایەکە کە هاوتای تاوانەکە بێت.
**taliped** (tal′ə-ped′), *adj.* = clubfooted.
*n.* کەسێکی پێ خواروخێچ؛ پێ گێڕ.
**talipes** (tal′ə-pēz′), *n.* = clubfoot.
**talipot** (tal′i-pot′), *n.* جۆرە دارخورمایەکە گەڵاکەی لە باوەشێن دەچێ
(بۆ باوەشێن‌و چەترو کاغەز بەکاردەهێنرێت).
(هەروەها: " talipot palm ").
**talisman** (tal′is-mən, tal′iz-mən), *n.* (١) نوشتە؛ چاوەزار؛
تەلیسم. (٢) جادوو؛ شتێکی جادوویی:
***( Her most powerful ~ was her beauty.)***
**-talismanic; talismanical** *(adj.)*.
**talk** (tôk), *v.i.* (١) قسەکردن؛ ئاخاوتن؛ دووان.
(٢) بە دەست‌و چاو قسەکردن: ***( to ~ by signs)*** .
(٣) قسەی هیچ‌وپووچ کردن؛ چەنەدان.
(٤) بەدگۆیی کردن؛ خراپە ووتنی کەسێك.
(٥) ڕاوێژکردن؛ پرس پێکردن.
*v.t.* (١) ووتن؛ بە دەم ووتن. (٢) قسە پێکردن.
(٣) باسکردن؛ لێکۆڵینەوە.
(٤) وا لێکردن بە قسە بۆ کردن؛ سازکردن: ***( to ~ him into agreement)***
*n.* (١) ئاخاوتن؛ قسە؛ قسەکردن؛ ووتووێژ؛ گفتوگۆ؛ دەمەتەقێ.
(٢) ووتار: ***( He gave a ~ at the university.)*** .
(٣) لێکۆڵینەوە؛ لێدووان؛ باسکردن.
(٤) قاو؛ بەدگۆیی؛ واتەوات.
(٥) قسەی بێ بایەخ؛ قسەی هیچ‌وپووچ؛ چەنەدان: ***( It's just ~ .)*** .
(٦) [Colloq.]، شێوە زمان؛ زار.
**talk around,** (١) پێ سەلماندن.
(٢) قسەکردن بەبێ مەبەست دان بە دەستەوە.
**talk at,** (١) توانج تێگرتن؛ قسە بۆ یەکێك کردن بەڵام لەگەڵ یەکێکی تردا
بوون. (٢) قسە بۆ کردن بەبێ بایەخدان بە هەست‌و ئەستی گوێگرەکە:
***( She always talks at people, never with them.)***
**talk away,** چەنەبازی کردن؛ زۆرووێژی کردن؛ زۆر قسەکردن.
**talk back,** قسە پێ ووتنەوە؛ لە ڕوودا هەڵگەڕانەوە؛
چەنە بە چەنە وەستان.
**talk big,** [Slang], خۆهەڵکێشان؛ فشەکردن؛ لاف‌و گەزاف لێدان.
**talk down,** (١) کەسی بەرامبەر دەمکوت کردن بە دەنگی بەرزو زۆر ووتن.
(٢) لە نرخ کەم کردنەوە.
**talk down to,** زۆر بە ئاسانی قسەکردن بۆ کەسێك یا کەسانێك هەر وەك
ئەو کەسانە هیچ نەزانن یا بێ مێشك بن:
***( He always insults people by talking down to them.)***
**talk (someone) into,** دڵ پێ داهێنان؛ سازکردن؛ سازاندن.
**talk of,** (١) باسکردن؛ لێدووان. (٢) نیازی خۆ دەربڕین.
**talk one's head off,** [Slang], وەڕس کردن بە چەنەبازی؛
بێ تاقەت کردن بە زۆرووێژی.
**talk out,** (١) بە دووروودرێژی باسکردن. (٢) بە دەنگی بەرز قسەکردن.
(٣) وەڕس کردن بە چەنەبازی. (٤) [British]، بە دەسەنقەست دواخستنی
دەنگدان لەسەر گەڵاڵەی یاسایەك لە پەرلەماندا بە زۆرووێژی.
**talk (someone) out of,** پەشیمان کردنەوە؛ سارد کردنەوە.
**talk over,** (١) باسکردن؛ لێدووان؛ لێکۆڵینەوە.
(٢) پێ سەلماندن؛ ڕاکێشانە سەر ڕای خۆ.
**talk up,** (١) پیاهەڵدان؛ بە باشە باسکردن.
(٢) [Colloq.]، بە دەنگی بەرز قسەکردن.
(٣) [Colloq.]، بە بێ شەرمانە قسەکردن.
**talkative** (tôk′ə-tiv), *adj.* چەنەباز؛ زۆرووێژ؛ هەلەوەڕ؛ زۆربلێ؛
لەوەچە؛ سازنگە؛ درێژدادڕ.
**-talkativeness** *(n.)*.
**talker** (tôk′ẽr), *n.* کەسێکی چەنەباز یا زۆرووێژ.
**talkie** (tôk′i), *n.* [Colloq.], فیلمی دەنگدار.
**talking book,** تەوانی پەڕتووك لەسەر تۆمارکراو (بۆ کوێرەکان).
**talking machine,** = phonograph.
**talking picture,** فیلمی دەنگدار.

**talking-to** (tôk′iŋ-tōō′), *n.* [Colloq.], سەرزەنشت

**talky** (tôk′i), *adj.* (١) talkative .

(٢) ڕێسە؛ درێژە پێدراو؛ قسە یا گفتوگۆی تێدایە: ***(a ~, boring novel)*** .

**tall** (tôl), *adj.* (١) بالابەرز؛ بەرز؛ درێژ (بالا)؛ کەڵەگەت:

***(a ~ woman, building, plant, etc.)***

(٢) ئەوەندە بالای بەرزە یا درێژە: ***(five feet ~)*** .

(٣) [Obs.]، (ا) جوان؛ شۆخ؛ قۆز. (ب) ئازا؛ چاونەترس.

(٤) [Colloq.]، فشە؛ درۆ؛ بڕوای پێ ناکرێ: ***(a ~ tale)*** .

(٥) [Colloq.]، زل؛ گەورە: ***(a ~ drink)*** .

(٦) [Colloq.]، فشە؛ بۆش و خۆهەڵکێش: ***(~ talk)*** .

(٧) گران (کار)؛ زەحمەت: ***(a ~ order to fill)*** .

**tallage** (tal′ij), *n.* (١) زەوییانە: باجێکی کۆنە پاشاکانی ئینگلیز دەیان سەند (٢) زەوییانە: باجێکە دەرەبەگ لە جووتیارەکانی دەسەند.

***v.t.*** باجی زەوی لێ سەندن.

**tallboy** (tôl′boi′), *n.* = **highboy.**

**tallier** (tal′i-ēr), *n.* ژمێریار

**tallish** (tôl′ish), *adj.* نەختێك بالابەرز؛ تۆزێك کەڵەگەت یا درێژ.

**tallith** (tal′ith, tä′lis), *n.* کالایەکە وەك ملپێچ جوولەکەکان دەیدەن بەسەر شانیاندا لە کاتی نوێژکردندا.

**tallow** (tal′ō), *n.* بەز؛ پیو

***v.t.*** (١) بە بەز چەورکردن؛ پیو لێدان.

(٢) دابەستن یا قەڵەوکردنی ئاژەڵ بۆ بەزەکەی.

**-tallowy** *(adj.)*.

**tally** (tal′i), *n.* (١) داری ژماردن: دارێکی پلەپلەدارە بۆ حساب ڕاگرتن (بەتایبەتی قەرز). (٢) شتی لەسەر تۆمارکراو. (٣) حساب؛ ژمێرە. (٤) بەرامبەر. (٥) گونجان؛ لەیەکچوون. (٦) ژمارە؛ پلە. (٧) نیشانە.

***v.t.*** (١) تۆمارکردن. (٢) ( **up** ~ )، ژماردن؛ کۆکردنەوە؛ لێکدانەوە؛ سەرجەم دەرهێنان. (٣) نیشانەکردن. (٤) گونجاندن (دوو شت لەگەڵ یەکتری).

***v.i.*** (١) تۆمارکردن؛ نووسین. (٢) گونجان؛ ڕێکەوتن.

**tallyho** (tal′i-hō′), *interj.* هاواری ڕاوکەرە کە ڕێوی دەبینێ (بۆ سەگ تێ کردنی).

***n.*** (١) ئەم جۆرە هاوارە. (٢) گالیسکەی چوار ئەسپی.

**tallyman** (tal′i-mən), *n.* (١) تۆمارکەر

(٢) [British]، بازرگانی بە قیست شت فرۆش.

**Talmud** (tal′mud, täl′mood), *n.* تەلموود سەرجەمی یاسار ئامۆژگاری ئاینی جوولەکە.

**-Talmudic; Talmudical** *(adj.)*.

**Talmudist** (tal′məd-ist), *n.* (١) یەکێك لە نووسەرەکان یا کۆکەرەوەکانی " تەلموود " (وشەی پێشوو ببینە).

(٢) زانای تەلموود. (٣) پەیڕەویکەری تەلموود.

**talon** (tal′ən), *n.* (١) (*pl.*) : چڕنووك (باڵندەو گیانداری چوارپێ)؛ چنگ (٢) (*pl.*)، دەست و پەنجەی ئادەمیزاد؛ چنگ.

(٣) سپرینگی قفڵ: ئەو بەشەی قفڵە کە کلیلەکە دەیجووڵێنێ بۆ کردنەوەی.

(٤) نەخشی خانووسازی.

(٥) پاشماوەی کاغەزی قومارو یاری پاش دابەشکردنی.

**taloned** (tal′ənd), *adj.* چڕنووکدار؛ چنگدار

**talus** (tā′ləs), *n.* (١) خرتکە؛ خڕکە؛ قاپ. (٢) قولەپێ؛ قولەقاچ.

**talus** (tā′ləs), *n.* (١) لێژایی؛ لێژگە. (٢) دیوی لێژی دیواری سەنگەر.

(٣) کۆمەڵە بەردی شکاوی لێژی دامێنی کەندەلانێك.

**tam** (tam), *n.* = **tam-o'-shanter.**

**tamable, tameable** (tām′ə-b'l), *adj.* ماڵی دەکرێ.

**tamale** (tə-mä′li), *n.* تومالی: خواردەمەنییەکی مەکسیکییە بریتییە لە ئاردی گەنمەشامی و قیمەو دەڵووبیبەری سووری پێچراوە لەناو گەلای گوڵە گەنمەشامیدا.

**tamandua** (tä′män-dwä′), *n.* گیاندارێکی بچووکی مێروولەخۆرە (لەسەر دارو درەخت دەژی).

**tamarack** (tam′ə-rak′), *n.* (١) درەختێکی زەلکاوییە لە توخمی کاج. (٢) داری ئەم درەختە.

**tamarau** (tä′mə-rou′), *n.* گامێشێکی کێوی بچووکی فیلیپینییە.

**tamarin** (tam′ə-rin), *n.* مەیموونێکی بچووکی کلك درێژی ئەمەریکای باشوورە.

**tamarind** (tam′ə-rind′), *n.* خورمای هیندی؛ تەمر هیندی:

(ا) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە. (ب) بەری ئەم درەختە کە دەخورێت و بۆ دەرمان و چێشتیش بەکاردەهێنرێت.

**tamarisk** (tam′ə-risk′), *n.* دارگەز؛ گەز.

**tambour** (tam′boor), *n.* (١) دەف؛ تەپڵ؛ دەهۆڵ.

(٢) تەختی نەقشکاری. (٣) نەقشکاری سەر ئەم تەختە.

**tambourin** (tam′boo-rin), *n.* (١) جۆرە تەپڵێکی درێژە.

(٢) (ا) جۆرە سەمایەکی خێرایە. (ب) مۆسیقای ئەم سەمایە.

**tambourine** (tam′bə-rēn′), *n.* دەف.

**tame** (tām), *adj.* (١) ماڵی؛ هۆگر. (٢) دەستەمۆ؛ بەسزمان.

(٣) سەرکز؛ مل کەچ. (٤) خاو؛ لاواز: ***(~ talk)*** .

***v.t.*** (١) ماڵی کردن. (٢) دەستەمۆکردن؛ هێنانە بەر بار؛ مل پێ کەچ کردن.

(٣) لە توندوتیژی کەم کردنەوە؛ هێمن کردنەوە؛ خاوکردنەوە.

**-tamely** *(adv.)*; **tameness** *(n.)*; **tamer** *(n.)*.

**tameable** (tām′ə-b'l), *adj.* = **tamable.**

**tameless** (tām′lis), *adj.* (١) کێوی؛ دەشتەکی.

(٢) ماڵی ناکرێ؛ ماڵی نابێ

**tam-o'-shanter** (tam′ə-shan′tēr), *n.* تەپلەیەکی ئوسکوتلەندی سەر خڕو تەختی گوڵوڵنکەدارە.

**tamp** (tamp), *v.t.* (١) پەستانەوە؛ داگرتنەوە؛ کوتانەوە.

(٢) کوتانەوە یا داگرتنەوەی خۆڵ و لم لە دەوری تەقەمەنیدا پێش تەقاندنەوەی.

**tamper** (tamp′ēr), *n.* (١) کەسێکە کە شت دەکوتێتەوە یا دەپەستێتەوە. (٢) ئامێری کوتانەوە یا داگرتنەوە.

**tamper** (tam′pēr), *v.i.* (١) ( **with** ~ )، دەستکاری کردن؛ دەستکاری کردن و تێکدان: ***(to ~ with a delicate mechanism)*** .

(٢) ( **with** ~ )، خۆتێهەڵقورتان؛ دەست تێخستن:

***(to ~ with another's feelings)***

(٣) ( **with** ~ )، بەرتیل دان؛ دەست تێخستن بە شێوەیەکی نایاسایی:

***(to ~ with a jury; ~ with a contract)***

***v.t.*** گۆڕین بە نایاسایی؛ دەستکاری کردن؛ دەست تێوەردان.

**tampion** (tam′pi-ən), *n.* دەمەوانەی لوولەی تۆپ و تفەنگ (کە تێی دەخرێ لە کاتی بەکارنەهێنانیدا بۆ ڕاگرتنی بە پاکی).

**tam-tam** (tum′tum′), *n.* زەنگێکی خەپلەیی نەختێ قوپاوە بە دارە تەپڵ لێدەدرێ.

**tan** (tan), *n.* (١) توێکڵی داربەڕوو، دارمازوو، جەوت و مازوو.

(٢) ماددەیەکە لەم توێکڵانە دەردەهێنرێ بۆ پێستە خۆشکردن.

(٣) ڕەنگی قاوەیی کاڵ.

(٤) گەنم ڕەنگی پێست (بەهۆی خۆ هەڵخستنەوە لەبەر خۆر)؛ ڕەشتاڵەیی.

***adj.*** (١) هی پێستە خۆشکردن؛ هی دەباخچێتی.

(٢) گەنم ڕەنگ؛ ڕەشتاڵە؛ قاوەیی کاڵ.

***v.t.*** (١) پێستە خۆشکردن؛ دەباخ کردن.

(٢) ڕەش هەڵگەڕاندنی پێست (بە خۆ هەڵخستن لەبەر خۆر).

(٣) [Colloq.]، بیرازکردن؛ فەلاقەکردن؛ کوتان.

***v.i.*** (١) خۆش دەکرێ (پێستە)؛ دەباخ دەکرێ.

(٢) ڕەش دادەگیرسێ (پێست)؛ گەنم ڕەنگ دەبێ.

**tan one's hide, [Colloq.],** بیرازکردن؛ فەلاقەکردن؛ کوتان.

**tan, tan.** (tan), = **tangent.**

**tanager** (tan′ə-jēr), *n.* باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگی بچووکی ئەمەریکییە

**tanbark** (tan′bärk′), *n.* توێکڵی دەباخی؛ توێکڵی داربەڕو و مازو و

چەوت :کە بۆ پێستە خۆشکردن بەکاردەهێنرێن).

**tandem** (tan′dəm), *adv.* یەك لە دوای یەك؛ بە یەك ڕیز.

*n.* (١) گالیسکەیەکی دوو ئەسپییە یەك بە دوای یەکەوە.

(٢) چەند ئەسپێکی گالیسکەی یەك بە دوای یەکەوە.

(٣) پاسکیلێکی دوو پێچکەیی و دوو زینیی یەك بە دوای یەکەوە.

*adj.* یەك لە دوای یەك؛ بە دوای یەکەوە.

**in tandem,** بە دوای یەکەوە (وەك کاروان)؛ یەك لە دوای یەك:

***( We were driving our cars in tandem.)***

**tang** (taŋ), *n.* (١) کلك یا زمانەی چەقۆو بڕبەنگ و ئەسکەنە (کە دەکرێتە دەسکەکەیدا) (٢) تام یا بۆنی تیژ یا مزر.

(٣) ( ~ of )، ئەختێك؛ تۆزێك (٤) تامێك یا چۆنێتییەکی تایبەتی.

*v.t.* کلك بۆ کردن (چەقۆ، بڕبەنگ... هتد).

**tang** (taŋ), *n.* زرنگانەوە؛ زرنگە؛ زرنگەزرنگ.

*v.t. & v.i.* زرنگانەوە

**tangelo** (tan′jə-lō′), *n.* نارنج

**tangency** (tan′jən-si), *n.* لێکەوتن؛ بەرکەوتن.

**tangent** (tan′jənt), *adj.* لێکەوت؛ بەرکەوت (ئەندازە).

*n.* لێکەوت (ئەندازە)؛ هێڵی لێکەوت؛ بەرکەوت.

**go ( or fly ) off at ( or on ) a tangent,** لە باس لادان؛ لە باس چوونە دەرەوە

**tangential** (tan-jen′shəl), *adj.* (١) لێکەوتوو؛ بەرکەوتوو؛ بەرکەوت (٢) لە باس دەرچوو؛ پەیوەندی نییە بە باسەکەوە.

(٣) بە سەرپێیی لە باسەکە دەدوێ؛ بە ڕووکەشی لە باسەکە دەدوێ.

**tangerine** (tan′jə-rēn′, tan′jə-rēn′), *n.* (١) لالەنگی.

(٢) پرتەقاڵی؛ ڕەنگی پرتەقاڵی.

**tangible** (tan′jə-b'l), *adj.* (١) هەستی پێ دەکرێ؛ هەستپێکراو؛ بە چاو بینراو (٢) هەڵدەسەنگێنرێ: *( ~ property)* .

(٣) (ا) دەتوانرێ تێی بگەیت. (ب) دیار؛ ڕاست؛ ڕاستەقینە: *( ~ evidence)* .

(٤) ئەوتۆ؛ زۆر *( ~ progress)* .

*n.* (١) شتی بە چاو بینراو یا هەستپێکراو؛ شتی دیار.

(٢) (*pl.*)، سەرمایەیەکە کە بتوانرێ هەڵسەنگێنرێ؛ سەرمایەی دیار.

**-tangibility** *(n.)*; **tangibleness** *(n.)*; **tangibly** *(adv.)*.

**tangle** (taŋ′g'l), *v.t.* (١) ئاڵۆزاندن؛ شێواندن بەسەر یەکدا؛ تێك ئاڵاندن (٢) تووش کردن؛ تووشی گیروگرفت کردن.

(٣) بە داوەوەکردن.

*v.i.* ئاڵۆزان؛ شێوان؛ تێك ئاڵان.

*n.* (١) شتی ئاڵۆزاو؛ شتی شێواو؛ شتی گرێ کوێرە تێکەوتوو؛ شتی تێك ئاڵاو.

(٢) ئاڵۆزان؛ تێك ئاڵان؛ شێواوی؛ تێکەڵاووپێکەڵاوی.

(٣) واق وڕمان؛ سەرسوڕمان؛ سەر لێ شێوان.

**to tangle with,** ئەمبازبوون؛ بە گژداچوون.

**tangle** (taŋ′g'l), *n.* جۆرێکە لە گیای دەریا.

**tangled** (taŋ′g'ld), *adj.* ئاڵۆز؛ ئاڵۆزاو؛ گیروگرفتاوی

**tangly** (taŋ′gli), *adj.* ئاڵۆز؛ گرێ کوێراوی؛ ئاڵۆزاو

**tango** (taŋ′gō), *n.* (١) تانگۆ جۆرە سەمایەکی ئەمەریکای لاتینییە.

(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.

*v.i.* تانگۆ کردن

**tangram** (taŋ′grəm), *n.* مەتەڵێکی چینییە بریتییە لە دابەشکردنی چوارگۆشەیەك بە پێنج سێگۆشەو لەبزینەیەك و چوارگۆشەیەکەوەو پێکهێنانی شێوەی جیا جیا لەمانە.

**tangy** (taŋ′i), *adj.* مزر؛ مێخۆش

**tank** (taŋk), *n.* (١) ئەستێل؛ حەوز؛ گۆم؛ گۆماو

(٢) (ا) تانکی ئاو؛ دەفری گەورەی شلە.

(ب) تانکی (ئوتومبیل): *( a gasoline ~ )*

(٣) دەبابە

(٤) [Slang]. زیندان؛ ژووری بەندیخانە؛ بەندیخانە.

*v.t.* عەمارکردن؛ کردنە تانکییەوە.

**tankage** (taŋk′ij), *n.* (١) فراوانی تانکی؛ ئەوەندە شلەی کە تانکییەك دەیگرێ. (٢) ئاوو بەنزین و شلەی تر هەڵگرتن لە تانکیدا.

(٣) کرێی ئەم عەمارکردنە.

(٤) ئێسقان و پاشماوەی تری قەسابخانە (کە دەهاڕرێ و دەکرێ بە پەین...هتد).

**tankard** (taŋk′ērd), *n.* کووپێکی درێژی دەسك و قەپاغداری شت خواردنەوەیە. (بەتایبەتی کە لە زیو دروست کرابێ).

**tank car,** (١) تانکی گازۆلین و ئاو گواستنەوە بە شەمەندەفەر.

(٢) **tank truck** .

**tank destroyer,** دەبابە شکێن: زرێدارێکە دەبابە شکێنی لەسەر دابەستراوە.

**tanker** (taŋk′ēr), *n.* (١) کەشتی نەوت گواستنەوە؛ نەوت کێش.

(٢) **tank car** . (٣) **tank truck** .

**tank farming,** ڕووەك بەخێوکردن لە پەیناودا لەباتی خاك.

**tankful** (taŋk′fool), *adj.* پڕ تانکییەك؛ تانکییەك.

**tank town,** (١) وێستگەی ئاو هەڵگرتنی شەمەندەفەر.

(٢) شارێکی بچووك و هیچ وپووچ.

**tank truck,** لۆری گازۆلین؛ گازۆلین کێش.

**tannage** (tan′ij), *n.* (١) پێستە خۆشکردن؛ دەباخ کردن.

(٢) پێستەی خۆشکراو.

**tannate** (tan′āt), *n.* خوێی ترشی تانیك.

**tanner** (tan′ēr), *n.* پێستە خۆشکەر؛ دەباخچی.

**tannery** (tan′ēr-i), *n.* دەباخانە؛ جێی پێستە خۆشکردن.

**tannic** (tan′ik), *adj.* تانیکی؛ هی پێستە خۆشکردن؛ هی دەباخچێتی؛ هی ترشی تانیك.

**tannic acid,** ترشی تانیك: بۆ پێستە خۆشکردن بەکاردەهێنرێ.

**tannin** (tan′in), *n.* = **tannic acid.**

**tanning** (tan′iŋ), *n.* (١) پێستە خۆشکردن؛ دەباخچێتی.

(٢) پێست ڕەش هەڵگەڕان بە خۆ هەڵخستن لەبەر خۆر.

(٣) [Colloq.]، فەلاقە؛ فەلاقەکردن؛ بیرازکردن.

**tansy** (tan′zi), *n.* گیایەکی گوڵ زەردی بۆن خۆشی پزیشکییە.

**tantalate** (tan′tə-lāt′), *n.* خوێی ترشی تەنتالیك.

**tantalic acid,** هی ترشی تەنتالیك.

**tantalize** (tan′tə-līz′), *v.t.* تامی تامی دان.

**-tantalization** *(n.)*.

**tantalizing** (tan′tə-līz′iŋ), *adj.* هەست جوڵێن؛ تامی تامی دەر؛ خۆش؛ دڵبەر.

**tantalum** (tan′tə-ləm), *n.* تانتالیۆم: توخمێکی کانزایی خۆڵەمێشی ژەنگ هەڵنەمێنە.

**Tantalus** (tan′tə-ləs), *n.* (١) تانتالۆس: پاشایەکی یۆنانی بوو سزاکەی لە دۆزەخدا برسێتی و تینوێتی هەتاهەتایی بوو بەوەی کە هەرچی چەند لەناو ئاودا وەستابوو کە دەیویست بیخواتەوە ئاوەکە دەکشایەوە وە لەژێر درەختی بەرداردا بوو بەڵام قەت دەستی نەدەگەیشتە میوەکە. (ئەفسانەی یۆنان). (٢) [t-]، دۆڵابێکە خواردنەوەی تێدایە لەبەرچاو، بەڵام داخراوەو کەس دەستی ناگاتە خواردنەوەکە.

**tantamount** (tan′tə-mount′), *adj.* بریتییە لە؛ ئەوە دەگرێتەوە.

**tantara** (tan′tə-rə, tan-tar′ə, tan-tä′rə), *n.* دەنگی زوڕنا؛ دەنگی کەڕەنا.

**tantivy** (tan-tiv′i), *adv.* بە غارغارێن؛ بە خێرا.

*adj.* خێرا؛ تیژڕەو.

*n.* (١) غارغارێن؛ خێرا ڕۆیشتن.

(٢) تێخوڕینێکە لە کاتی ڕاودا بۆ خێراکردن.

**tantrum** (tan′trəm), *n.* شێتگیری؛ ووڕك؛ ووڕك گرتن:

***( The child was having a ~ .)***

**Taoism** (tou′iz'm, dou′iz'm), *n.* فەلسەفەی تاوی: فەلسەفەو

ئاینێکی چینیيه لەسەر بیروباوەڕی " لاوتسی " داوای سادەیی و لەخۆبوردن دەکات

-**Taoist** *(n.)*; **Taoistic** *(adj.)*.

**tap** (tap), *v.t.* (١) بە ئەسپایی لێدان؛ پەلەپیتکە لێدان.
(٢) بە ئەسپایی پێ لێدان. (٣) (ا) بنی تازە تێگرتنی پێڵاو.
(ب) ناڵ دان لە پاژنە یا لەژێر پەنجەی پێڵاو.

*v.i.* (١) بە ئەسپایی لێدان؛ پەلەپیتکە لێدان.
(٢) تەقەی پێڵاو هاتن لە ڕۆیشتندا.

*n.* (١) (ا) لێدانێکی بە ئەسپایی؛ پەلەپیتکە.
(ب) دەنگی ئەم لێدانە یا پەلەپیتکەیە. (٢) (ا) بنی تازە تێگیراوی پێڵاو.
(ب) ناڵی لە پاژنە یا ژێر پەنجەی پێڵاو دراو (بۆ سەما).

**tap** (tap), *n.* (١) بەلووعە. (٢) دەمەوانە؛ تۆپەوانە؛ تەپەدۆر.
(٣) بیرەی لە بەلووعە تێکراو (هی ناو بەرمیل).
(٤) دەرهێنانی شلەی لەش (نەشتەرکاری).
(٥) ئامێری هەڵکەندنی دانی برغو. (٦) [Colloq.]، مەیخانە؛ بار.
(٧) جۆری لق لێ جیابوونەوەی تەلی کارەبا.

*v.t.* (١) دەمەوانە تێخستن؛ تەپەدۆر تێخستن؛ قەپاغ خستنە سەر.
(٢) کون تێکردن بۆ شلە لێوە دەرهێنان.
(٣) تۆپەوانە لێ دەرهێنان؛ تەپەدۆر لێ دەرهێنان.
(٤) شلە لێ ڕۆکردن یا دەرهێنان.
(٥) شلە لە لەش چۆڕاندنەوە (نەشتەرکاری).
(٦) لق تێکردنەوە.
(٧) لێ سەندن؛ لێ وەرگرتن:
***( to ~ a person for money, information, etc.)***
(٨) پێوەبەستن بە دزییەوە (بۆ گوێ لێگرتن): ***( to ~ a telephone wire)*** .
(٩) دان هەڵکەندن لەسەر برغو.

**on tap,** (١) ئامادەیە بۆ تێکردن (وەك بیرەی ناو بەرمیل کە بە بەلووعە ئەیێ دەردەهێنرێ). (٢) ئامادەیە بۆ بەکارهێنان.

**tapa** (tä′pä), *n.* (١) توێکڵی دارتووی کاغەز.
(٢) قوماشێکی کاغەز ئاسایە لەم توێکڵە درووست دەکرێ.

**tap dance,** سەمای تەقەتەق؛ تەقەسەما: سەمایەکی خێرایە سەماکەرەکە پاژنە و سەری پێی دەکوتێ بە زەویداو تەقەی لێ هەڵدەسێنێ.

-**tap dancer.**

**tap-dance** (tap′dans′, tap′däns′), *v.t.* تەقەسەما کردن

**tape** (tāp), *n.* (١) بەن. (٢) شریت: ***( a magnetic ~ )*** .
(٣) شریتی رایەڵ کراو بەسەر هێڵی تەواوبوونی پێشبڕکێدا.
(٤) tapeline .

*v.t.* (١) پێچانەوە بە بەن؛ شریت تێوە پێچان؛ بە شریت قایم کردن.
(٢) پێوان بە شریتی پێوان
(٣) تۆمارکردن (لەسەر شریت).

*v.i.* پێوان

**tape deck,** شریت تۆمارکەری سادە.
(هەروەها " tape recorder " ).

**tapeline** (tāp′līn′), *n.* = **tape measure.**

**tape measure,** شریتی پێوان؛ مەترە.
(هەروەها " measuring tape " و " tapeline " ) .

**taper** (tā′pēr), *n.* (١) (ا) مۆمی کڵێسە. (ب) مۆمی باریك.
(٢) پلیتەی درێژی مێواوی (بۆ مۆم و چرا داگیرساندن).
(٣) ڕووناکی کز.
(٤) (ا) بەرەبەرە سەر باریك بوونەوە؛ تەنك بوونەوە:
***( the ~ of a pyramid)***
(ب) بەرەبەرە کەم بوونەوە یا کزبوون (دەسەڵات، هێز، چالاکی).
(٥) شتی سەر باریك یا تەنك.

*adj.* سەر باریك؛ سەر باریك بووەوە؛ تەنك بووەوە

*v.t. & v.i.* (١) بەرەبەرە باریك کردنەوە یا تەنك کردنەوە؛ سەر باریك بوونەوە؛ داداان (پێنووس). (٢) کەم کردنەوە؛ کەم بوونەوە؛ کزبوون؛ کووژانەوە؛ بەسەرچوون

**taper off,** (١) بەرەبەرە سەر باریك بوونەوە یا تەنك بوون.
(٢) بەرەبەرە وەستان؛ بەرەبەرە کزبوون یا نەمان؛ بەسەرچوون؛ کووژانەوە:
***( The storm is beginning to taper off.)***

**tape-record** (tāp′ri-kôrd′), *v.t.* تۆمارکردن (لەسەر شریتی موگناتیسی)

**tape recorder,** شریت تۆمارکەر و لێدەر.
(هەروەها " tape deck " ).

**tapestry** (tap′is-tri), *n.* قوماشی چنراو و نەخشێنراو (بۆ پەردەو بەرگی کورسی و قەنەفە)؛ قوماشی ڕازێنراوە بە وێنە و نەخش و نیگار؛ قوماشی زەرکەش.

*v.t.* (١) ڕازاندنەوە بەم جۆرە قوماشە؛ داپۆشین بەم جۆرە قوماشە
(٢) لەسەر ئەم جۆرە قوماشە نەخشاندن یا کێشان (وێنە، نەخش).

**tape-worm** (tāp′wûrm′), *n.* کرمی شریتی.

**tap-house** (tap′hous′), *n.* *Also* **tap house,** مەیخانە؛ بار

**tapioca** (tap′i-ō′kə), *n.* تاپیۆکا: ئاردێکە لە ڕەگی " مانیۆك " دەردەهێنرێ و دەکرێ بە شیرینییەکی وەك محەللەبی.

**tapir** (tā′pēr), *n.* گیاندارێکی زل گیاخۆری شەوگەڕی ناوچە گەرمەکانە لە بەراز دەچێ.

**tapis** (tap′ē, tap′is), *n.* پەردەو پایەخ و سەرمێزی چنراو و نەخشێنراو.

**on ( or upon ) the tapis,** لێی دەکۆڵرێتەوە.

**tappet** (tap′it), *n.* چوکڵەی مەکینە (کە ناوبەناو دەجووڵێتەوە کە بەر پارچەیەکی تری مەکینەکە دەکەوێ).

**tapping** (tap′iŋ), *n.* (١) (ا) لێدان بە ئەسپایی؛ پەلەپیتکە لێدان.
(ب) لێ دەرهێنان. (٢) شلەی بە بەلووعە دەرهێنراو (بیرە).

**taproom** (tap′rōōm′, tap′room′), *n.* = **barroom.**

**taproot** (tap′rōōt′, tap′root′), *n.* ڕەگی مێخی؛ ڕەگی سەرەکی (کە ڕاست دەچێتە خوارەوە بە خاکداو ڕەگی بچووکی لێ دەبێتەوە).

**taps** (taps), *n.pl.* دەنگی کەڕەنا یا تەپڵ لێدان (لە ئۆردوگادا بۆ کارەبا کوژانەوە کاتی نووستن یا لە ناشتنی سەربازو ئەفسەردا).

**tapster** (tap′stēr), *n.* (١) barmaid . (٢) bartender .

**tar** (tär), *n.* قیر؛ قەتران

*v.t.* قیر لێدان؛ قیراوی کردن؛ قیر تێهەڵسوون.

*adj.* (١) قیری؛ لە قیر دەچێ. (٢) قیراوی.

**tar and feather,** قیرو پەڕ تێهەڵسوون (بۆ سزادان).

**tarred with the same brush ( or stick ),** وەك یەك وان؛ لەیەك دەچن (لە خراپیدا).

**tar** (tär), *n.* [Colloq.], دەریاوان.

**tarantella** (tar′ən-tel′ə), *n.* (١) سەمایەکی دووکەسی خێرای ئیتاڵییە. (٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.

**tarantism** (tar′ən-tiz′m), *n.* شێتی سەما؛ نەخۆشی سەما؛ خولیای سەما.

-**tarantist** *(n.)*.

**tarantula** (tə-ran′choo-lə), *n.* جاڵجاڵۆکەیەکی ژەهراوی گەورەی تووکنە.

**tarboosh** (tär-bōōsh′), *n.* فێست؛ تەربووش.

**tardigrade** (tär′di-grād′), *n.* گیاندارێکی زۆر بچووکی ناوی سستی جومگە جومگەیە چوار جووت لاقی هەیە.

*adj.* (١) سست؛ خاو؛ هێواش.
(٢) تایبەتی بە گیاندارێکی زۆر بچووکی ناوی سستی جومگە جومگە.

**tardiness** (tär′di-nis), *n.* (١) دواکەوتن بۆ کار یا قوتابخانە؛ تەمەڵی؛ ئامادە نەبوون لە کاتی خۆیدا. (٢) سستی؛ خاوی؛ خاوخلیچکی.

**tardy** (tär′di), *adj.* (١) دواکەوتوو بۆ کار یا قوتابخانە؛ تەمەڵ؛ نائامادە لە کاتی خۆیدا. ***( Some students are habitually ~ .)***

(٢) سست؛ خاو؛ هێواش؛ خاوەخلیچك.

-tardily *(adv.)*.

**tare** (târ), *n.* (١) ڕووەكێكی خۆهەڵواس یا خشۆكی گەڵا بچووكە بۆ ئالیك بەكاردێت. (٢) تۆوی ئەم گیایە. (٣) بژار (لە ئینجیلدا).

**tare** (târ), *n.* (١) پارسەنگ؛ سەنگی دەفر، سندووق، لۆری... هتد كە لە سەرجەمی سەنگ دەردەكرێ بۆ دۆزینەوەی قورسی بارەكە یا ناوەڕۆكەكە. (٢) ئەم لێدەركردنە.

**tare** (târ), *archaic past tense and past participle of* tear.

**tarentism** (târ'ən-tiz'm), *n.* = tarantism.

**targe** (tärj), *n.* [Archaic], قەڵغانی بچووك.

**target** (tär'git), *n.* (١) قەڵغان.
(٢) نیشان؛ نیشانە؛ شتی دەستنیشانكراو.
(٣) نیشانی تفەنگ تێگیراو؛ نیشانی تەقە لێكراو.
(٤) نیشانی هێرش بردنە سەر لەلایەن سوپاوە.
(٥) كەسێكی پلار تێگیراو، گاڵتەپێكراو یا ڕەخنە لێ گیراو.

*v.t.* دەستنیشانكردن؛ نیشان لێ گرتنەوە.

**tariff** (tar'if), *n.* تاریف؛ باجی گومرگ؛ گومرگانە.

*v.t.* تاریف خستنە سەر؛ گومرگ كردن؛ گومرگانە لێ سەندن.

**tarlatan, tarletan** (tär'lə-t'n), *n.* جۆرە قوماشێكی مۆزلینی تەنك و ڕووشنە

**tarmac** (tär'mak), *n.* (١) [T-] ، ماددەیەكی قیرتاوكردنە لە قیر یا ئەسفەڵت دەچێ. (٢) شوێنی قیرتاوكراو بەم ماددەیە بەتایبەتی مۆڵگەی فڕۆكە لە فڕۆكەخانەدا. (٣) ڕێگای قیرتاوكراو بەم ماددەیە.

**tarmacadum**, = tarmac 1 & 3.

**tarn** (tärn), *n.* دەریاچە یا گۆمی ناوشاخ.

**tarnation** (tär-nā'shən), *interj. & n.* = damnation.

**tarnish** (tär'nish), *v.t.* (١) بریقە نەهێشتن؛ بێ ڕەنگ كردن؛ شەوق مراندن. *( The damp atmosphere has ~ed this metal.)* .
(٢) لەكەداركردن؛ ناو پیس كردن؛ ناوزڕاندن؛ پیس كردن:
*( to ~ someone's reputation, image, etc.)*

*v.i.* (١) بریقە نەمان؛ ڕەنگ چوونەوە؛ ڕەنگ تێكچوون یا نەمان.
(٢) لەكەداربوون؛ ناوزڕان؛ ناو پیس بوون؛ پیس بوون.

*n.* (١) ڕەنگ چوونەوە؛ ڕەنگ نەمان؛ بێ بریقەیی؛ بێ ڕەنگی.
(٢) لەكە؛ پەڵە؛ خەوش؛ نەنگ.
(٣) ڕوویەكی ڕەنگ چووەوە؛ ڕوویەكی بێ بریقە یا ڕەنگ مردوو.

**taro** (tä'rō), *n.* (١) ڕووەكێكی گەڵا پانی ناوچە گەرمەكانە ڕەگەكەی دەخورێ. (٢) ڕەگی ئەم ڕووەكە.

**tar-paper** (tär-pā'pēr), *n.* كاغەزی قیراوی بۆ سەربان گرتن بەكاردەهێنرێ.

**tarpaulin** (tär-pô'lin, tär'pə-lin), *n.* (١) تەرپۆلین؛ جانفاسی مێو تێهەڵسواو یا قیر تێهەڵسواو (كە ئیتر ئاو دانادات و شتی پێ دادەپۆشرێ)؛ مشەمما. (٢) پارچەیەكی ئەم جانفاسە.
(٣) پانتۆ یا شەپقەی مشەمما؛ مشەمما.
(٤) [Archaic]، دەریاوان.

**tarpon** (tär'pon), *n.* ماسییەكی دەریایی گەورەی پوولەكە زیوییە.

**tarragon** (tar'ə-gon'), *n.* تەرخوون

**tarriance** (tar'i-əns), *n.* [Archaic], (١) دواكەوتن؛ زۆر پێ چوون؛ ڕاگیربوون؛ خۆ خستن بە قنگدا.
(٢) مانەوە بۆ ماوەیەك؛ مانەوەی سەردەمی.

**tarry** (tar'i), *v.i.* (١) دواكەوتن؛ زۆر پێ چوون؛ قنگەقنگ كردن؛ ڕاگیربوون؛ زۆر مانەوە. (٢) مانەوە (بەتایبەتی زیاتر لەوەی كە بەتەمابوون)؛ مانەوە بۆ سەردەمێك. (٣) چاوەڕێ كردن.

*v.t.* [Archaic], چاوەڕێ كردن

*n.* مانەوەیەكی كورت؛ مانەوەیەكی كەم یا سەردەمی

**tarry** (tär'i), *adj.* (١) قیری؛ قیرین (٢) قیراوی؛ قیر تێهەڵسواو.

**tarsal** (tär's'l), *adj.* (١) قولەپێیی؛ تایبەتی بە قولەپێ.
(٢) هی شانەكانی پێڵووی چاو.

**tarsier** (tär'si-ēr), *n.* مەیموونێكی بچووكی شەوگەڕی چاو زل و خڕی كلك درێژە لەسەر درەخت دەژی.

**tarsometatarsus** (tär'sō-met'ə-tär'səs), *n.* ئێسقانی لوولاقی باڵندە.

**tarsus** (tär'səs), *n.* (١) (ا) قولەپێ. (ب) ئێسقانەكانی قولەپێ.
(ج) شانەكانی پێڵووی چاو. (٢) (ا) tarsometatarsus .
(ب) دوا جومگەی لاقی جانەوەر.

**tart** (tärt), *adj.* (١) تفت؛ تفت‌وتاڵ؛ مزر؛ ترش؛ تیژ.
(٢) توند (ووتە)؛ بڕ؛ بڕندە؛ تیژ: *( a ~ answer)* .

**tart** (tärt), *n.* كێكێكی بچووكە ناوەكەی مرەبای تێدایە.

**tart** (tärt), *n.* قەحبە؛ ئافرەتی سووك.

**tartan** (tär't'n), *n.* (١) جۆرە قوماشێكی خوری میل میلی چەپ‌وڕاستە لە ئوسكوتلەندە لەبەردەكرێ. (٢) نەخشی ئەم قوماشە.

**tartan** (tär't'n), *n.* كەشتی بچووكی یەك ستوونییە.

**Tartar** (tär'tēr), *n.* (١) تەتەر. (٢) [t-] ، كەسێكی تووڕەوتڕۆ و دڕ.

catch a tartar, ئەمبازی یەكێكی لە خۆ بەهێزتر بوون؛ خۆ تووش كردن بە ئەمبازبوونی كەسێكی زۆر بەهێز.

**tartar** (tär'tēr), *n.* (١) بەڵغی شەرابی ناو بەرمیل.
(٢) بەڵغی زەردی بەردتاسای سەر ددان.

**tartare sauce,** سۆسێكە بە ماسییەوە دەخورێ.

**tartaric acid,** ترشی تەرتەریك.

**Tartarus** (tär'tə-rəs), *n.* دۆزەخ؛ جەهەننەم.

**tartrate** (tär'trāt), *n.* خوێی ترشی تەرتەریك.

**tartufe, tartuffe** (tär-toof'), *n.* كەسێكی دووڕوو.

**task** (task, täsk), *n.* (١) باج.
(٢) كاری پێ سپێردراو؛ ئەركی پێ سپێردراو:
*( He gave each worker a ~ to do.)*
(٣) كار؛ فرمان؛ ئیش؛ ئەرك.
(٤) كاری گران؛ ئەركی گران.

*v.t.* (١) باج لێ سەندن.
(٢) كار پێ سپاردن؛ ئەرك خستنە سەر شان؛ ئیش بەسەردا دان.
(٣) ماندوو كردن؛ ئەرك زۆر خستنە سەر؛ بوون بە بار بە سەرەوە.

take to task, سەرزەنشتكردن؛ لێپرسینەوە؛ لۆمەكردن.

**task force,** هێزی ئەرك جێبەجێكردن؛ دەستەیەكن كە ئەركێكی تایبەتییان دەدرێ بەسەر شاندا.

**Tasmanian** (taz-mā'ni-ən, taz-mān'yən), *adj.* تایبەتی بە " تاسمانیا " و گەلەكەی.

*n.* تاسمانی؛ كەسێكی تاسمانی (لە ئوسترالیا).

**Tasmanian devil,** گیاندارێكی تووڕەكەدارە مەڕ دەخوات.

**Tasmanian wolf,** گورگی تاسمانی.

**task-master** (task'mas'tēr, täsk'mäs'tēr), *n.* سەركار (بەتایبەتی هی بەزەبرووزەنگ)؛ چاوەشی بەزەبر.

**task-work** (task'wûrk', täsk'wûrk'), *n.* (١) فرمان؛ ئەركی پێ سپێردراو؛ كاری پێ سپێردراو. (٢) ئیشی قورس و ناخۆش. (٣) piecework .

**tass** (tas, täs), *n.* (١) تاس؛ تاسۆلكە. (٢) پڕ تاسێك.

**tasse** (tas), *n. Also* tasset, پەڕەی قەڵغان.

**tassel** (tas''l), *n.* (١) گوڵۆنكە؛ گوڵنكە؛ گێزوگوڵنگ؛ ڕیشوو (فێست، مشكی و جامانە). (٢) پڕ (وەك هی گوڵە گەنمەشامی).

*v.t.* (١) گوڵۆنكە كردن؛ وەك گوڵۆنكە لێكردن. (٢) بە گوڵۆنكە ڕازاندنەوە.
(٣) پڕ لێكردنەوە (گوڵە گەنمەشامی).

*v.i.* پڕ دەركردن (گوڵە گەنمەشامی).

**taste** (tāst), *v.t.* (١) تاقیكردنەوە بە دەست تێوەدان.

(٢) چەشتن؛ تام کردن؛ خوێ چەشتن. (٣) هەست پێکردن لە ڕێی چەشتنەوە.
(٤) نمەك کردن؛ نەختێ خواردن یا خواردنەوە.
(٥) خواردن؛ خواردنەوە: *( He hasn't ~ed a thing.)* .
(٦) [Archaic or Rare]، حەزلێکردن؛ بەدڵ بوون (تام).
**v.i.** (١) تام لە یەك جیاکردنەوە. (٢) ( ~ **of** )، نمەك کردن؛ نەختێ خواردن.
(٣) تامێکی تایبەتی هەبوون: *( The salad ~s of garlic.)* .
(٤) چەشتن (بەسەرهات).
**n.** (١) (ا) تاقیکردنەوە. (ب) چەشتن؛ تام کردن. (٢) هەستی چەشتن.
(٣) حەژ؛ تام؛ چەش. (٤) نمەك؛ نەختێ خواردن یا خواردنەوە بۆ تام چەشتن.
(٥) تامی تایبەخۆی شتێك؛ چەژی تایبەخۆ. (٦) نموونە.
(٧) نەختێك؛ تۆزێك؛ تۆسقاڵێك.
(٨) هەست و توانای چاك و خراپ لێك جیاکردنەوە؛ سەلیقە؛ زەوق.
(٩) حەزلێکردن؛ مەیل؛ حەز: *( a ~ for red ties)* .
**in bad ( or poor ) taste.** نابەجێ؛ ناشرین (کردەوە، ڕەووشت، ووتە).
**in good ( or excellent ) taste,** بەجێ؛ جوان (کردەوە، ووتە).
**in taste, = in good taste.**
**to one's taste,** (١) بەدڵ بوون؛ حەزلێکردن. (٢) بۆ بەدڵ بوون.
**taste bud,** مەمیلەی چەشتن (بەسەر زمانەوە کە هەستی چەشتنیان تێدایە)؛ گۆی تام کردن.
**tasteful** (tāst′fəl), ***adj.*** (١) [Rare]، خۆش؛ بەتام.
(٢) نیشانەی سەلیقە جوانییە؛ هەست و سەلیقە جوان؛ جوان (کردەوە، ڕەفتار).
**-tastefully** ***(adv.)***; tastefulness ***(n.)***.
**tasteless** (tāst′lis), ***adj.*** (١) (ا) بێ تام؛ ناخۆش.
(ب) ووشك؛ ناخۆش.
(٢) نیشانەی بێ سەلیقەیی و هەستی ناشرینە؛ ناشرین؛ نابەجێ.
(٣) [Rare]، تام نەکەر؛ هیچی بۆ ناچێژرێ.
**-tastelessly** ***(adv.)***; **tastelessness** ***(n.)***.
**taster** (tās′tēr), ***n.*** (١) (ا) کەسێکە پیشەی خواردنەوە چەشتنە وەك مەی و چا بۆ تاقیکردنەوەی چاك و خراپی.
(ب) بەردەستێکە خواردەمەنی دەچێژێ پێش سەرگەورەکەی لەبەر ژەهر.
(٢) ئامێری بەکارهێنراو لە چەشتندا.
**tasty** (tās′ti), ***adj.*** (١) خۆش؛ بەتام؛ بەچێژ.
(٢) [Colloq.]، نیشانەی سەلیقە و هەستی جوانە؛ جوان.
**-tastily** ***(adv.)***; **tastiness** ***(n.)***.
**tat** (tat), ***v.t. & v.i.*** ڕیزە گوێ تێکردن
**tat** (tat), ***n.*** لێدان؛ مستەکوڵە؛ شەپلاخ.
**tit for tat,** یەك بە یەك (تۆڵەسەندن)؛ ئەمە بەوە؛ هەق بە هەق.
**Tatar** (tä′tēr), ***n.*** (١) تەتەر؛ تەتەرێك.
(٢) زمانی تەتەری؛ تەتەری.
***adj.*** تایبەتی بە تەتەر و زمانەکەیان.
**'tater** (tā′tēr), ***n.*** [Dial.], = **potato.**
**tatter** (tat′ēr), ***n.*** (١) شیتاڵ؛ پارچەی دڕاو و شۆڕبووەوەی کاڵا.
(٢) پەڕۆ (٣) *(pl.)*، جل و بەرگی شڕووڕ؛ جلی دڕاو؛ شڕە.
***v.t.*** شڕووڕکردن؛ دڕاندن
***v.i.*** شڕووڕبوون؛ دڕان.
**tatterdemalion** (tat′ēr-di-māl′yən), ***n.*** شڕپۆش؛ شڕۆڵ؛ کەسێکە کە جلی شڕووڕ لەبەر دەکات.
**tattered** (tat′ērd), ***adj.*** (١) شڕووڕ؛ دڕاو.
(٢) شڕپۆش؛ شڕۆڵ؛ جلی شڕووڕ لەبەرکەر.
**tattersall** (tat′ēr-sôl′), ***adj.*** نەخشی خانەخانە و ڕەنگاوڕەنگی تێدایە *( a ~ vest)* .
**tatting** (tat′iŋ), ***n.*** (١) تیلماسکە قوماشێکی کون کونی تەنکە گرێ گرێی تیا دەچنرێ و بۆ پەراوێز بەکاردەهێنرێ.
(٢) گرێ گرێیاوی کردنی ئەم جۆرە قوماشە.
**tattle** (tat′'l), ***v.i.*** (١) چەنەبازی کردن؛ زۆروێژی کردن.
(٢) نهێنی خەڵك خستنەڕوو؛ قاوخستنەوە؛ لە پاشەملە باسی خەڵك کردن.
***v.t.*** چەنەبازی کردن و نهێنی خەڵك درکاندن.
***n.*** چەنەبازی؛ زۆروێژی؛ قسەی بێ تام؛ بەدگۆیی.
**tattler** (tat′'l-ēr, tat′lēr), ***n.*** (١) کەسێکی چەنەباز یا زۆربلێ؛ کەسێکی بەدگۆ. (٢) جۆرێکە لە چۆلەکەی ئاوی زۆر زیقەزیق دەکات.
**tattletale** (tat′'l-tāl′), ***n.*** = **talebearer.**
**tattoo** (ta-tōō′), ***v.t.*** خاڵ کوتان.
***n.*** خاڵی کوتراو؛ خاڵ.
**tau** (tô, tou), ***n.*** تیپی نۆزدەهەمی ئەلف وبێی یۆنانییە کە بەرامبەری " T " ی ئینگلیزییە.
**tau cross,** خاچێکە لە شێوەی تیپی T دا.
**taught** (tôt), *past tense and past participle of* **teach.**
**taunt** (tônt, tänt), ***adj.*** زۆر درێژ یا بەرز (دارکەشتی).
**taunt** (tônt, tänt), ***v.t.*** (١) تیز پێوەکردن؛ کلك پێوەکردن؛ سەرزەنشتکردن؛ قەشمەری پێکردن؛ پلار تێگرتن.
(٢) تووڕەکردن بە قەشمەری پێکردن؛ پاڵ پێوەنان بۆ کردنی شتێك بە سەرزەنشتکردن و گاڵتەپێکردن.
***n.*** (١) قەشمەری؛ پلار؛ قسەی بەتەوسەوە؛ تیز؛ سەرزەنشتی.
(٢) [Obs.]، گاڵتەچی؛ قەشمەر.
**taupe** (tōp), ***n.*** خۆڵەمێشی تۆخ.
**taurine** (tôr′īn, tôr′in), ***adj.*** (١) کەڵەگایی؛ هی گاجووت.
(٢) تایبەتی بە بورجی گا (ئەستێرەناسی).
**taurine** (tôr′ēn, tôr′īn, tôr′in), ***n.*** ئاوێتەیەکی بلووری بێ ڕەنگە (کیمیا).
**Taurus** (tôr′əs), ***n.*** (١) ناوی کۆنەستێرەیەکە.
(٢) بورجی گا؛ بورجی کەڵەگا.
**taut** (tôt), ***adj.*** (١) جەڕاو؛ جەڕیو؛ جەڕێنراو: *( a ~ rope)* .
(٢) گرژ؛ دەمارگرژ؛ گرژ: *( a ~ smile)* .
(٣) پاك وتەمیز؛ خاوێن؛ ڕێك وپێك.
**tauten** (tôt′'n), ***v.t. & v.i.*** جەڕاندن؛ جەڕان؛ گرژکردن؛ هێنانەوەیەك.
**tauto-** (tô′tō, tô′tə), پێشگرێکە بەمانای: هەمان: *( tautology)* .
**tautog** (tô-tog′), ***n.*** ڕەشەماسی (لە دەریای ئەتلەنتیك لە کەناری ئەمەریکا). (پێشی دەووترێ: " **blackfish** ").
**tautologize** (tô-tol′ə-jīz′), ***v.i.*** دووبارەکردنەوەی ناپێویست؛ قسە جوونەوە؛ درێژەپێدانی بێ کەڵك.
**tautology** (tô-tol′ə-ji), ***n.*** (١) دووبارەکردنەوەی ناپێویست؛ درێژەپێدانی بێ کەڵك؛ قسە جوونەوە.
(بۆ نموونە: " **necessary essentials** ").
(٢) نموونەیەکی ئەم دووبارەکردنەوە بێ کەڵکە.
-tautological ***(adj.)***; tautologist ***(n.)***.
**tautonym** (tô′tə-nim), ***n.*** هەمان ناو: بەکارهێنانی هەمان ناو بۆ توخم و ناوی تایبەتی گیاندارێك یا ڕووەکێك لە هاوپۆل کردندا.
**tavern** (tav′ērn), ***n.*** (١) مەیخانە؛ باڕ. (٢) خان.
**taverner** (tav′ēr-nēr), ***n.*** (١) مەیخانەچی؛ خاوەن مەیخانە.
(٢) ئامشۆکەری مەیخانە.
**taw** (tô), ***n.*** (١) دەسکەلا (هەڵماتێن). (٢) هەڵماتێن؛ موشێن؛ تیلێن.
(٣) سەرشار؛ شوێنی تیل لێوە کردن.
***v.i.*** تیل کردن.
**taw** (tô), ***v.t.*** (١) پێستە خۆشکردن؛ دەباخ کردن.
(٢) [Obs. or Dial.]، فەلاقەکردن؛ بیرازکردن؛ کوتان.
**tawdriness** (tô′dri-nis), ***n.*** زەقی؛ بریقەدارییەکی هەرزان بەها؛ ڕازاندنەوەی ناشرین و لە ئەندازە بەدەر.
**tawdry** (tô′dri), ***adj.*** زەق؛ بریقەدار و هەرزان بەها؛ ڕازاوە بە ناشرینی و لە ڕادە بەدەر.
**tawny, tawney** (tô′ni), ***adj. & n.*** ڕەشتاڵە؛ ڕەش هەڵگەڕاو؛

گەنم ڕەنگ
**tax** (taks), *v.t.* (١) نرخ هەڵسەنگاندن؛ نرخ لەسەر دانان؛ خەمڵ کردن.
(٢) باج لێ سەندن؛ باج گرتن؛ باج لەسەر دانان.
(٣) ئەرك خستنە سەر؛ بار قورس کردن؛ ماندووکردن:
***( The work ~ed his strength.)***
(٤) تاوانبارکردن
*n.* (١) باج (٢) ئەرکی گران؛ باری قورس.
**taxable** (tak′sə-b'l), *adj.* باجی لەسەرە.
**-taxability** ***(n.).***
**taxation** (tak-sā′shən), *n.* (١) باج سەندن؛ باج گرتن؛
باج خستنە سەر (٢) (ا) باج (ب) دەسکەوتی باج؛ داهاتی باج.
**tax-collector** (taks′kə-lek′tēr), *n.* باجگر
**tax-deductible** (taks′di-duk′tə-b'l), *adj.* باجی لەسەر نادرێ؛
باجی لێ ناگیرێ؛ لەو پارەیە دەردەکرێ کە باجی دەسکەوتی لەسەر دەدرێ.
**tax evasion,** باج نەدان؛ ڕاکردن لە باج
**tax-exempt** (taks′ig-zempt′), *adj.* باجی لەسەر نییە؛
باجی لێ ناگیرێ
**tax-free** (taks′frē′), *adj.* باجی لەسەر نادرێ؛ باجی لەسەر نییە
**taxi** (tak′si), *n.* تەکسی؛ ئوتومبێلی کرێ (هەروەها " **taxicab** ").
*v.i.* (١) سواری تەکسی بوون؛ بە تەکسی چوون بۆ گەشت؛ بە تەکسی ڕۆیشتن.
(٢) بەسەر ڕەویدا ڕۆیشتن (فڕۆکە).
**taxicab** (tak′si-kab′), *n.* تەکسی؛ ئوتومبێلی کرێ.
**taxidermist** (tak′si-dûr′mist), *n.* مۆمیاکەر؛ مۆمیاکار.
**taxidermy** (tak′si-dûr′mi), *n.* مۆمیاکردن؛ مۆمیاکاری.
**-taxidermal** ***(adj.)***; **taxidermic** ***(adj.).***
**taxi-meter** (tak′si-mē′tēr), *n.* کرێ ژمێری تەکسی؛ ئامێرێکە
لەناو تەکسیدا کرێکەی دەژمێرێ بەپێی دووری ئەو شوێنەی بۆی دەچێ.
**taxis** (tak′sis), *n.* (١) دەستە لەشکر (٢) جووڵانەوەی گیانەوەر بەهۆی
هاندەری دەرەوە (٣) هێنانەوە جێی خۆی ئەندامێکی لەش بە دەست نەك بە
نەشتەرگەری (قۆزی)
**-taxis** (tak′sis), *Also* –taxy, پاشگرێکە بەمانای: ڕێكوپێکی؛
ڕێکخستن ***( thermotaxis)*** .
**taxi-stand** (tak′si-stand′), *n* وێستگەی تەکسی (بۆ چاوەڕێ
کردنی کرێچی)
**taxon** (tak-son′), *n.* توخم (گیانەوەرناسی)؛ دەستە گیانەوەری
یەك توخمی
**taxonomy** (tak-son′ə-mi), *n.* (١) زانستی هاوپۆل کردن؛
بابەتکاری؛ هاوپۆلکاری. (٢) هاوپۆل کردنی گیاندارو ڕووەك.
**-taxonomic; taxonomical** ***(adj.)***; **taxonomically** ***(adv.)***;
**taxonomist** ***(n.).***
**taxpayer** (taks′pā′ēr), *n.* باجدەر
**tax rate,** ڕێژەی باج
**tax shelter,** هۆی دەسکەوت شاردنەوە لەلایەن خەڵك و کۆمپانیاکانەوە
بۆ باج لەسەر نەدان.
**-taxy** (tak′si), = -taxis.
**TB,** = tuberculosis.
**T-bone** (tē′bōn′), *n.* پارچەیەك گۆشتی گایە ئێسقانێکی تێدا بێ
لە شێوەی " T " دا (پێشی دەووترێ: " **T-bone steak** ").
**tbs., tbsp.,** = tablespoon; tablespoonful.
**tea** (tē), *n.* (١) چا (٢) [Chiefly British]، ژەمێك خواردنی سووکەڵەیە
لە پاش نیوەڕۆ یا دەمەو ئێوارەدا بریتییە لە وردە بابەتی خواردەمەنی و
شیرینی و چا (٣) ئاهەنگی چا.
**tea bag,** توورەکە چا؛ توورەکە چای بچووکە دەخرێتە ناو کوپ و قۆرییەوە.
**tea ball,** (١) تۆپێکی بچووکی کانزایی کون کونە چای ووشکی تێ دەکرێ و
دەخرێتە ناو کوپ و قۆرییەوە. (٢) **tea bag**

**tea-berry** (tē′ber′i), *n.* (١) ڕووەکێکی خشۆکی گەڵا بریقەداری گوڵ
زەنگۆڵەیییە بەری وەك تووترك دەگرێ. (٢) بەری ئەم ڕووەکە.
**tea biscuit,** پسکیتی چا.
**tea cart,** = tea wagon.
**teach** (tēch), *v.t.* فێرکردن؛ وانە ووتنەوە.
*v.i.* مامۆستایەتی کردن؛ وانە ووتنەوە.
**teachable** (tēch′ə-b'l), *adj.* فێر دەکرێ؛ تواناى فێربوونی هەیە.
**-teachability** ***(n.).***
**teacher** (tēch′ēr), *n.* مامۆستا؛ فێرکار؛ فێرکەر.
**teachers college, teachers' college,** دانشگای مامۆستایان.
**teach-in** (tēch-in′), *n.* کۆڕی فێرکردن: کۆڕێکە لە دانشگا و زانکۆدا
دەگیرێ بە بەشداربوونی مامۆستایان و قوتابیان بەتایبەتی بۆ باسکردنی
کاروباری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و... هتد.
**teaching** (tēch′iŋ), *n.* (١) مامۆستایەتی؛ پیشەی مامۆستا.
(٢) (*pl.*)، بیروباوەڕ؛ ئامۆژگاری: ***( the ~s of the prophets)***
**tea cozy,** کڵاوقۆری: کڵاوێکە دەکرێ بەسەر قۆرییەوە بۆ سارد
نەبوونەوەی چاکە. (هەروەها " **cozy** ").
**teacup** (tē′kup′), *n.* کووپی چا.
**teacupful** (tē′kup-fool′), *n.* پڕ کووپێکی چا.
**tea dance,** سەمای پاش نیوەڕۆی درەنگ.
**tea-house** (tē′hous′), *n.* چایخانە.
**teak** (tēk), *n.* (١) درەختی ساج: درەختێکی ناوچە گەرمەکانە دارەکەی
قاوەیی زەردباوە و سەختە. (٢) تەختە و داری سەختی ئەم درەختە.
**tea-kettle** (tē′ket′'l), *n.* کتلی.
**teak-wood** (tēk′wood′), *n.* = teak.
**teal** (tēl), *n.* (١) سۆنە؛ جۆرە مراوییەکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگی
ڕووبارییە. (٢) شینی سەوزباو. (هەروەها " **teal blue** ").
**team** (tēm), *n.* (١) (ا) [Obs.]، نەوە؛ وەچە؛ وەجاخ؛ نەتەوە.
(ب) [Dial.]، پۆلی بەچکە مراوی و بەراز.
(٢) جووتە گا؛ جووتە ئەسپ (بۆ جووت کردن یا گالیسکە ڕاکێشان).
(٣) (ا) جووتە بارگیر. (ب) بارگیرێك و گالیسکەکەی.
(٤) تیپ؛ دەستە؛ تاقم؛ کۆمەڵ.
*v.t.* (١) نیلە لە مل کردن پێکەوە؛ جووت بەستن؛ پێکەوە بەستن و جووت
پێ کردن یا گالیسکە پێ ڕاکێشان. (٢) بە گالیسکە ڕاکێشان یا گواستنەوە.
*v.i.* (١) جووت کردن؛ گالیسکە لێخوڕین.
(٢) ( **up** ~ )، هەرەوەزکردن؛ یەکگرتن؛ هاوکاری کردن.
**teammate** (tēm′māt′), *n.* هاوتیپ؛ هاودەستە.
**teamster** (tēm′stēr), *n.* (١) جووتیار؛ عەرەبانچی؛ لێخوڕی گالیسکە.
(٢) شۆفێری لۆری؛ لێخوڕی لۆری.
**teamwork** (tēm′wûrk′), *n.* هەرەوەز؛ ئیشی بە کۆمەڵ.
**tea party,** ئاهەنگی چا.
**tea-pot** (tē′pot′), *n.* قۆری؛ قۆریە.
**tea-poy** (tē′poi), *n.* (١) مێزی بچووکی سێپای ڕازێنەرەوە.
(٢) مێزی بچووکی چا.
**tear** (târ), *v.t.* (١) دڕاندن؛ هەڵدڕین؛ داتلیشاندن. (٢) کون تێکردن.
(٣) بریندارکردن؛ بڕین: ***( The saw tore his skin.)*** .
(٤) لێك جیاکردنەوە؛ پارچە پارچە کردن.
(٥) دوودڵ بوون؛ تێدا مان:
***( He was torn between duty and desire.)***
(٦) ( **~ up; ~ out; ~ away; ~ off** )، لێکردنەوە؛ لێ لابردن؛ هەڵکێشان؛
ڕاکێشان: ***( He tore the plant up by its roots.)*** .
*v.i.* (١) دڕان؛ هەڵتلیشان.
(٢) خێرا ڕۆیشتن؛ بەگوڕ ڕۆیشتن؛ بە پەلە کردن یا جووڵانەوە.
*n.* (١) دڕان؛ داتلیشان. (٢) دڕاوی؛ تلیش.
(٣) شێتگیری؛ زۆر توورەیی؛ هەڵچوون.

(٤) [Slang]، ئاهەنگو زەماوەندو خواردنەوەی زۆر.

**tear apart,** وونجڕ وونجڕ کردن؛ شڕووڕ کردن؛ پارچە پارچە کردن.

**tear at,** بە توند ڕاکێشان.

**tear down,** (١) ڕووخاندن: *( to tear down a building)*.
(٢) بەرپەرچدانەوە؛ پووچ کردنەوە.

**tear into,** بە توندی هێرش بردنە سەر.

**tear off,** بە پەلە کردن یا نووسین.

**tear** (têr), *n.* (١) فرمێسک (٢) *(pl.)*، خەمو خەفەت.

***v.i.*** فرمێسک ڕشتن؛ گریان.

**in tears,** فرمێسکاوی؛ فرمێسک لە چاو؛ بە گریانەوە.

**tear bomb,** بۆمبای فرمێسک ڕێژ.

**tear-drop** (têr′drop′), *n.* (١) فرمێسکێک؛ فرمێسک.
(٢) شتێکی لە فرمێسک چوو (خشڵ).

**tearful** (têr′fəl), *adj.* (١) فرمێسکاوی؛ فرمێسک لە چاو؛ گریاو.
(٢) فرمێسک ڕێژ؛ ناخۆش؛ دڵگیر؛ خەفەتدەر.

**-tearfully** ***(adv.)***; **tearfulness** ***(n.)***.

**tear gas,** گازی فرمێسک ڕێژ.

**tear-jerker** (têr′jûr′kẽr), *n.* [Slang]. چیرۆکی خەفەتدەرو خەڵک هێنەرە گریان (فیلمی سینەما، تەلەفزیۆن... هتد).

**tearless** (têr′lis), *adj.* (١) بێ فرمێسک.
(٢) ناتوانێ بگری؛ گریانی نایەت.

**tea-room** (tē′rōōm′, tē′room′), *n.* چایخانە

**tea rose,** (١) گوڵە چا گوڵێکی زەردو پەمەیی‌یە بۆنەکەی لە هی چا دەکات.
(٢) پەمەیی زەردباو.

**teary** (têr′i), *adj.* (١) فرمێسکاوی؛ گریاو: *( ~ eyes)*.
(٢) لە فرمێسک دەچێ.

**tease** (tēz), *v.t.* (١) شیکردنەوەو پوخت کردن (کەتان، خوری).
(٢) تیسکی قوماش بژکردنەوە بە فڵچەی تایبەتی. (٣) قژ بژکردنەوە.
(٤) تیز پێوەکردن؛ سەر خستنە سەر؛ کلك پێوەکردن؛ گاڵتە لەگەڵ کردن.
(٥) تامی تامی دان.
(٦) لەت لەت کردنی شانەی گیاندار بۆ تاقیکردنەوەی بە گەردبین.

***v.i.*** تیز پێوەکردن: سەر خستنە سەر؛ گاڵتە لەگەڵ کردن؛ کلك پێوەکردن.

***n.*** (١) تیز؛ تیز پێوەکردن؛ کلك پێوەکردن؛ گاڵتە.
(٢) تامی تامی دەر؛ گاڵتەباز؛ تیز پێوەکەر.
(٣) ئافرەتی بە مەکروناز.

**teasel** (tē′z'l), *n.* (١) چەند جۆرە ڕووەکێکن لە کەرتەشی دەچن.
(٢) گوڵی ئەم جۆرە ڕووەکە (کە ووشك دەبێتەوە بۆ تیسکی قوماش بژکردنەوە بەکاردەهێنرێت) (٣) ئامێری تیسکی قوماش بژکردنەوە.

***v.t.*** تیسکی قوماش بژکردنەوە.

**teaser** (tēz′ẽr), *n.* (١) کلك پێوەکەر؛ گاڵتەباز؛ تیز پێوەکەر؛ تامی تامی دەر. (٢) کێشەیەکی ناخۆشو پەستکەر.

**teaspoon** (tē′spōōn′, tē′spoon′), *n.* (١) کەوچکی چا
(٢) **teaspoonful**.

**teaspoonful** (tē′spōōn-fool′, tē′spoon-fool′), *adj.* پڕ کەوچکێکی چا؛ پڕ کەوچکە چایەك.

**tea-strainer** (tē-strā′nẽr), *n.* چاپاڵێو

**teat** (tēt), *n.* گۆی مەمك

**teatime** (tē′tīm′), *n.* کاتی چا خواردنەوە (پاش نیوەڕۆی درەنگ یا دەمەو ئێوارە).

**tea tray,** سینی چا.

**tea wagon,** مێزێکی پێچکەداری بچووکە بۆ هەڵگرتنی کەرەسەی چا و پێشکەش کردنی چا بە میوان. (هەروەها **" tea cart "**).

**teazel, teazle** (tē′z'l), *n. & v.t.* = **teasel.**

**technetium** (tek-nē′shi-əm), *n.* تەکنیتیۆم توخمێکی کانزایی‌یە (کیمیاگەری).

**technic** (tek′nik), *n.* (١) *(pl.)*، لیکۆڵینەوەی هونەرە تەکنیکی‌یەکان یا کردەنی‌یەکان. (٢) *(pl.)*، ڕێگاو شێوەی تەکنیکی بە دووورودرێژی.
(٣) **technical**.

**technical** (tek′ni-k'l), *adj.* (١) هی هونەرکاری؛ هی تەکنیکی:
*( T~ schools offer courses in welding, engineering, etc.)*
(٢) تایبەتی بە زانستێك یا هونەرێکی تایبەتی: *( T~ vocabulary)*.
(٣) تەکنیکی: *( ~ skills)*.
(٤) کەم؛ ناگرنگ: *( a ~ difference)*.

**-technically** ***(adv.)***.

**technicality** (tek′ni-kal′ə-ti), *n.* (١) تەکنیکێتی؛ تەکنیککاری.
(٢) خاڵێکی ناگرنگو بچووك لە هەڵسەنگاندنی مەسەلەیەکدا؛ خاڵێکی هیچوپووچ: *( He was convicted on a ~ .)*.

**technical knockout,** سەرکەوتنی بۆکسبازێكو دوایی پێ هێنانی یاری‌یەکە لەبەر بریندار بوونی بەرامبەرەکەی ئەگەرچی نەشدراوە بە زەویدا.

**technician** (tek-nish′ən), *n.* تەکنیککار؛ تەکنیکساز.

**technicolor** (tek′ni-kul′ẽr), *n.* وێنەکاریی ڕەنگاوڕەنگ (فیلمی سینەما).

**technics** (tek′niks), *n.pl.* (١) لێکۆڵینەوەی هونەرە تەکنیکی‌یەکان یا کردەنی‌یەکان. (٢) **technique**.

**technique** (tek-nēk′), *n.* (١) شێوەی کار؛ چۆنێتی کارکردن؛ هونەری کار؛ تەکنیك. (٢) پلەی شارەزایی؛ پلەی کارامەیی.

**techno-** (tek′nō, tek′nə), پێشگرێکە بەمانای: (١) هونەر؛ زانست؛ کارامەیی: *( technocracy)*.
(٢) تەکنیکی؛ تەکنۆلۆجی.

**technocracy** (tek-nok′rə-si), *n.* تێکنۆکراسی: ڕژێمی تەکنیکسازان؛ فەرمانڕەوایی تەکنیککارانو زانایان.

**technocrat** (tek′nə-krat′), *n.* تێکنۆکرات: فەرمانبەری ڕژێمی تەکنیکسازان؛ تەکنیکسازی خواز.

**-technocratic** ***(adj.)***.

**technological** (tek′nə-loj′i-k'l), *adj.* *Also* **technologic,** تێکنۆلۆجی؛ هی تێکنۆلۆجی.

**-technologically** ***(adv.)***.

**technology** (tek-nol′ə-ji), *n.* تێکنۆلۆجی: (ا) هونەری پیشەسازی؛ زانستی ئەم هونەری پیشەسازی‌یە؛ لێکۆڵینەوەی هونەری پیشەسازی.
(ب) زاراوەی زانیاری‌یەك یا هونەرێك؛ زمانی تێکنۆلۆجی.
(ج) زانیاری‌یە کردەنی‌یەکان.

**-technologist** ***(n.)***.

**techy, tetchy** (tech′i), *adj.* تەنگە جیکڵانە؛ تووڕەوتڕۆ؛ زوو هەڵچوو.

**tectonic** (tek-ton′ik), *adj.* (١) خانووسازی؛ تایبەتی بە خانووسازی؛ هی دروووستکردن. (٢) تایبەتی بە گۆڕانی توێکی زەمین؛ تایبەتی بە هۆو ئەنجامی ئەم گۆڕانە.

**tectonics** (tek-ton′iks), *n.pl.* (١) هونەری خانووسازی؛ خانووسازی؛ هونەری شتی جوانو بەکەڵك دروووستکردن (بەتایبەتی خانوو).
(٢) گۆڕانی توێکی زەمین (زەمیننناسی)؛ زانستی شێوەو پێکهاتنی زەمین

**ted** (ted), *v.t.* گیای تازە دووراوە هەڵخستن بۆ کردن بە گزرە.

**tedder** (ted′ẽr), *n.* (١) کەسێکە گیای تازە دووراوە هەڵدەخات بۆ کردنی بە گزرە. (٢) مەکینەی گیا بڵاوکەرەوە بۆ ووشك بوونەوەی.

**teddy** (ted′i), *n.* جلی یەك پارچەی ئافرەتە بریتی‌یە لە ئەتەكو دەرپێ.

**teddy bear,** بووکەشووشەی وورچ.

**tedious** (tē′di-əs, tē′jəs), *adj.* ووشكو ناخۆش (کار)؛ وەڕسکەر؛ بێزارکەر: *( ~ work)*.

**-tediously** ***(adv.)***; **tediousness** ***(n.)***.

**tedium** (tē′di-əm), *n.* ووشکیو ناخۆشی (کار)؛ بێ تاقەتی؛ تاقەت چوون؛ بێزاری.

**tee** (tē), ***n.*** (١) تیپی T, t . (٢) شتێک کە لە T بکات.
(٢) نیشان (لە هەندێ یاریدا).
***adj.*** لە T دەکات
**to a tee,** دەقاودەق؛ بێ کەم‌وزیاد؛ بە تەواوی:
***( That job would suit you to a tee.)***
**tee** (tē), ***n.*** (١) (أ) کۆمەڵێک لم یا خۆڵی قووچکەیی‌یە تۆپی گۆلفی لەسەر دادەنرێ بۆ لێدانی. (ب) مێخێکی بچووکە لەباتی ئەم کۆمەڵە لم یا خۆڵە بەکاردەهێنرێت. (٢) جێی یەکەم لێدانی تۆپی گۆلف.
***v.t. & v.i.*** تۆپی گۆلف خستنە سەر مێخێکی بچووک بۆ لێدانی.
**tee off,** (١) لێدانی تۆپی گۆلف لە سەرەتاوە
(٢) [Slang] دەستپێکردن.
(٣) پەستکردن؛ تووڕەبوون: ***( He was teed off because his guests were one hour late.)***
**teem** (tēm), ***v.i.*** (١) منداڵبوون؛ زاین.
(٢) پڕبوون لە؛ جمە هاتن: ***( The river is ~ing with fish.)*** .
**teem** (tēm), ***v.t.*** ڕۆکردن؛ ڕشتن.
***v.i.*** بە خوڕ باڕین؛ بە خوڕ هاتنەوە خوارەوە.
**teen** (tēn), ***n.*** [Archaic or Dia.], (١) زیان. (٢) تووڕەیی.
(٣) خەم؛ خەفەت
**-teen** (tēn), پاشگرێکە بەمانای: دە و: ***( thirteen; nineteen)*** .
**teenage** (tēn'āj'), ***adj.*** هی هەرزەکار؛ هەرزەیی: ***( ~ pregnancy)*** .
**teenager** (tēn'āj'ēr), ***n.*** هەرزەکار؛ کوڕ یا کچی سیانزدە تا نۆزدە ساڵان
**teens** (tēnz), ***n.pl.*** ژمارەی سیانزدە تا نۆزدە؛ تەمەنی سیانزدە تا نۆزدە ساڵی.
**teeny** (tē'ni), ***adj.*** [Colloq.], = **tiny.**
**teepee** (tē'pē), ***n.*** = **tepee.**
**tee shirt,** = **T-shirt.**
**teeter** (tē'tēr), ***v.i.*** (١) لەتردان؛ لارەولار کردن؛ بەم لاو بەولادا کەوتن.
(٢) دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن.
***v.t.*** لارەولار پێ کردن؛ لەراندنەوە؛ بەم لاو بەولادا خستن.
***n.*** لەنجە؛ لەرانەوە؛ لەتر؛ لارەولار کردن.
**teeter-totter** (tē'tēr-tot'ēr, tē'tēr-tô'tēr), ***n.*** = **seesaw.**
**teeth** (tēth), *plural of* **tooth.**
**teethe** (tē*th*), ***v.i.*** ددان دەرهاتن
**teetotal** (tē-tō't'l), ***adj.*** [Colloq.], (١) تەواوی؛ تەواوەتی؛ هەموو.
(٢) تایبەتی بە هەرگیز مەی نەخواردنەوە.
**teetotaler** (tē-tō't'l-ēr, tē-tōt'lēr), ***n. Also*** teetotalist, مەی نەخۆرەوە؛ عەرەق نەخۆر؛ کەسێکە کە هیچ خواردنەوەیەکی کحوولی نەخواتەوە.
**teetotalism** (tē-tō't'l-iz'm), ***n.*** عەرەق نەخواردنەوە؛ خواردنەوەی کحول نەخواردنەوە.
**teetotum** (tē-tō'təm), ***n.*** مزراح؛ جۆرە مزراحێکە لە یاری هایبەختدا بەکاردەهێنرێ.
**tegmen** (teg'men), ***n.*** (١) **tegument** .
(٢) بەرگ یا پێستی ناوەوەی تۆو.
**tegument** (teg'yoo-mənt), ***n.*** بەرگی سرووشتیی ئەندامی گیاندارێک یا ڕووەکێک
**-tegumental** ***(adj.)***; **tegumentary** ***(adj.).***
**te-hee** (tē-hē'), ***n.*** پرمە؛ دەنگی پێکەنینی لاقرتێ.
***v.i.*** بە لاقرتێوە پێکەنین.
**teil** (tēl), ***n. Also*** **teil tree,** = **linden.**
**tele-** (tel'ə), پێشگرێکە بەمانای: (أ) دوورکار؛ دوور؛ لە دوورەوە کاردەکات: ***( telegraph)*** .
(ب) تەلەفزیۆنی؛ بە تەلەفزیۆن کراو: ***( telecast)*** .
**telecast** (tel'ə-kast', tel'ə-käst'), ***v.t. & v.i.*** بە تەلەفزیۆن بڵاوکردنەوە.
***n.*** پەخشنامەی تەلەفزیۆنی؛ بەرنامەی تەلەفزیۆنی.
**telecommunication** (tel'ə-kə-mū'nə-kā'shən), ***n.*** (١) ***(pl.)***، پەیوەندی بێ تەل (بە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و تەلەگراف)؛ پەیوەندی دوور.
(٢) نامەی بۆ دوور ڕاگەیێنراو.
**telecourse** (tel'ə-kôrs', tel'ə-kōrs'), ***n.*** کۆرس یا وانەی بە تەلەفزیۆن ووتراوە.
**teledu** (tel'ə-dōō'), ***n.*** گیاندارێکی بچووکی گۆشتخۆرە بۆنێکی پیسی لێ دەبێتەوە وەک سەگلاو.
**telegenic** (tel'ə-jen'ik), ***adj.*** بۆ پیشاندان لەسەر تەلەفزیۆن دەشێ؛ جوان دەنوێنێ لەسەر تەلەفزیۆن.
**telegram** (tel'ə-gram'), ***n.*** برووسکە؛ تەل؛ تەلسز؛ برووسکەی بێ تەل.
**telegraph** (tel'ə-graf', tel'ə-gräf'), ***n.*** (١) تەلەگراف: ئامێری نامە ناردن بە برووسکە. (٢) **telegram** .
***v.t.*** (١) نامە ناردن بە برووسکە.
(٢) برووسکە بۆ ناردن؛ برووسکە بۆ کردن؛ تەل بۆ کردن.
***v.i.*** برووسکە ناردن؛ برووسکە کردن.
**telegrapher** (tə-leg'rə-fēr), ***n.*** تەلچی؛ برووسکە نێر.
**telegraphic** (tel'ə-graf'ik), ***adj.*** (١) برووسکەیی؛ تایبەتی بە برووسکە. (٢) کورت (ووتە، پەیام)؛ زۆر کورت.
**telegraphically** (tel'ə-graf'i-k'l-i), ***adv.*** (١) بە برووسکە؛ بە تەلسز. (٢) بە کورتی؛ زۆر بە کورتی.
**telegraphist** (tə-leg'rə-fist), ***n.*** = **telegrapher.**
**telegraphy** (tə-leg'rə-fi), ***n.*** برووسکە ناردن بە کارەبا.
**telemeter** (tel'ə-mē'tēr), ***n.*** دووریێو؛ ئامێری پێوان لە دوورەوە.
***v.t.*** پێوان و ڕاگەیاندنی ئەنجامی ئەم پێوانە لە دوورەوە (وەک لە کەشتی هەواییەوە).
**-telemetric** ***(adj.)***; **telemetrically** ***(adv.).***
**telemetry** (tə-lem'ə-tri), ***n.*** زانستی پێوان و ڕاگەیاندنی ئەنجامی ئەم پێوانە لە دوورەوە (وەک لە کەشتی هەواییەوە).
**telencephalon** (tel'en-sef'ə-lon'), ***n.*** بەشی پێشەوەی مێشک.
**teleology** (tel'i-ol'ə-ji, tē'li-ol'ə-ji), ***n.*** (١) بیروباوەڕێکی فەلسەفییە دەڵێت: کە هەموو دیاردەیەکی سرووشتی بۆ مەبەستێک و بەپێی نەخشەیەکی تایبەتی ڕوودەدات نەک هەر لە خۆیەوە.
(٢) ئەم مەبەست و نەخشەیە.
(٣) لێکۆڵینەوەی دیاردەی سرووشتی بۆ پاڵپشتی کردنی ئەم بیروباوەڕە.
**-teleological** ***(adj.)***; **teleologically** ***(adv.)***; **teleologist** ***(n.).***
**teleost** (tel'i-ost', tē'li-ost'), ***n.*** ماسییەکە کە پەیکەرەکەی ئێسقانی بێت (کە زۆربەی ماسی دەگرێتەوە).
***adj.*** تایبەتی بەم جۆرە ماسییە.
**teleostean** (tel'i-os'ti-ən), ***adj. & n.*** = **teleost.**
**telepathic** (tel'ə-path'ik), ***adj.*** دوورە سووسەیی؛ هی پەیوەندی بیر لە دوورەوە.
**-telepathically** ***(adv.).***
**telepathy** (tə-lep'ə-thi), ***n.*** بیر خوێندنەوە؛ پەیوەندی بیرو هەست لە دوورەوە؛ دڵ خەبەردان؛ پەیوەندی نێوان دوو کەس و ڕاگەیاندنی بیروڕا لە نێوانیاندا لە ڕێگای نادیارو هەستی ئاسایی بە دەرەوە.
**-telpathist** ***(n.).***
**telephone** (tel'ə-fōn'), ***n.*** دووربێژ؛ تەلەفۆن.
***v.i.*** تەلەفۆن کردن.
***v.t.*** (١) تەلەفۆن بۆ کردن.
(٢) پەیام پێ گەیاندن بە تەلەفۆن؛ بە تەلەفۆن پێ ووتن.
**telephone book,** = **telephone directory.**
**telephone booth,** قەفەزەی تەلەفۆن: ژوورۆچکەیەکە تەلەفۆنی

لێوە دەکرێ.

**telephone directory,** ڕابەری تەلەفۆن.
(هەروەها " **telephone book** ").

**telephone exchange,** تەلەفۆنگۆڕ (ئامێر)؛
بگۆڕی تەلەفۆن (کۆنەندام).

**telephone pole,** دارتەلەفۆن: دارتەل.

**telephone receiver,** بیستۆکی تەلەفۆن.

**telephonic** (tel´ə-fon′ik), ***adj.*** (١) تەلەفۆنی: تایبەت بە تەلەفۆن.
(٢) بە تەلەفۆن نێردراو.

**-telephonically** ***(adv.).***

**telephony** (tə-lef′ə-ni), ***n.*** پەیام ناردن بە تەلەفۆن.

**telephoto** (tel′ə-fō´tō), ***adj.*** (١) هی وێنەگرتنی دوور.
(٢) تایبەتی بە هاوێنەی کامێرای لە دوورەوە وێنەگر.

**telephotograph** (tel´ə-fō′tə-graf´, tel´ə-fō′tə-gräf´), ***n.***
(١) وێنەیەکە بە کامێرایەك گیرابێ کە هاوێنەی نزیك کەرەوەی تێدابێ.
(٢) وێنەی بە برووسکە نێردراو.
***v.t.*** (١) وێنەگرتن بە کامێرای هاوێنە نزیك کەرەوە.
(٢) وێنە ناردن بە برووسکە.

**telephotography** (tel´ə-fə-tog′rə-fi), ***n.*** (١) وێنەگرتن بە
کامێرای هاوێنە نزیك کەرەوە. (٢) وێنەو نەخشە ناردن بە برووسکە.

**-telephotographic** ***(adj.).***

**teleplay** (tel′ə-plā´), ***n.*** شانۆنامەی تەلەفزیۆنی.

**teleprinter** (tel′ə-prin´tēr), ***n.*** = **teletypewriter.**

**teleprompter** (tel′ə-promp´tēr), ***n.*** ئامێرێکە وتارخوێنی سەر
تەلەفزیۆن وتارەکەی لەبەر دەخوێنێتەوە بێ ئەوەی تەماشاکەران بیبینن.

**teleran** (tel′ə-ran´), ***n.*** [ **television radar air navigation**],
ڕابەری کردنی فڕۆکە بە تەلەفزیۆن و ڕادار.

**telescope** (tel′ə-skōp´), ***n.*** دووربینی ئەستێرە؛ تەلسکۆپ؛
تەلسکۆپی ئەستێرە.
***v.i.*** بەیەکداچوون (بۆری تەلسکۆپ).
***v.t.*** (١) بەیەکدا کردن. (٢) کورت کردنەوە. (٣) پەستانەوە؛ پەستن.

**telescopic** (tel´ə-skop′ik), ***adj.*** (١) تەلسکۆپی؛ تایبەتی بە
دووربینی ئەستێرە. (٢) بە تەلسکۆپ بینراو.
(٣) تەنها بە تەلسکۆپ دەبینرێ. (٤) دووربین (مرۆڤ).
(٥) بەناو یەکدا چوو.

**-telescopically** ***(adv.).***

**telescopy** (tə-les′kə-pi), ***n.*** زانستی دووربینی ئەستێرە
دروستکردن و بەکارهێنان؛ زانستی تەلسکۆپ.

**-telescopist** ***(n.).***

**telestereoscope** (tel´ə-ster′i-ə-skōp´), ***n.*** دووربینی شت بینین
بە تەنداری

**telethon** (tel′ə-thon´), ***n.*** بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی دوورودرێژە
بۆ پیتاك کردن بۆ پرۆژەیەکی خێرخوازی.

**teletype** (tel′ə-tīp´), ***n.*** جۆرێکە لە " **teletypewriter** ".
***v.i.*** بەکارهێنانی چاپی برووسکەیی.
***v.t.*** نامە ناردن بە چاپی برووسکەیی: نامە ناردن بە تیپنووسی برووسکەیی.

**teletypewriter** (tel´ə-tīp′rīt´ēr), ***n.*** چاپی برووسکەیی
تیپنووس یا ئامێرێکی چاپکردنە برووسکە دەنێرێ و وەردەگرێ.
(هەروەها " **teleprinter** ").

**teletypist** (tel′ə-tī´pist), ***n.*** کارگەری چاپی برووسکەیی.

**televiev** (tel′ə-vū´), ***v.t. & v.i.*** بە تەلەفزیۆن بینین؛
لەسەر تەلەفزیۆن بینین.

**-televiewer** ***(n.).***

**televise** (tel′ə-vīz´), ***v.t.*** بە تەلەفزیۆن بڵاوکردنەوە.

**television** (tel′ə-vizh´ən), ***n.*** (١) تەلەفزیۆن
(٢) دروستکردن و بەکارهێنانی تەلەفزیۆن.
(٣) بەرنامە بڵاوکردنەوە بە تەلەفزیۆن.

**television set,** تەلەفزیۆن.

**televisor** (tel′ə-vī´zēr), ***n.*** (١) ئامێری وەرگرو نێردەری تەلەفزیۆن.
(٢) هەواڵ خوێنەرەوەی سەر تەلەفزیۆن.

**telex** (tə-leks′), ***n.*** (١) تێلێکس: (ا) ئامێری برووسکەنێر (بەهۆی چاپی
برووسکەیی و تەلەفۆنەوە). (ب) نامە ناردن بە ئامێری برووسکەنێر.
(٢) نامەی بە تێلێکس نێردراو؛ برووسکەی بە تێلێکس نێردراو

**telfer** (tel′fēr), ***n. & v.t.*** = **telpher.**

**telferage** (tel′fēr-ij), ***n.*** = **telpherage.**

**telic** (tel′ik), ***adj.*** بە ئامانج.

**tell** (tel), *v.t.* (١) ژماردن. (٢) گێڕانەوە: ***( He told a story.)*** .
(٣) وتن؛ بێژان: دەربڕین. ***( T~ the facts. T~ the truth.)***
(٤) بڵاوکردنەوە.
(٥) پیشاندان؛ دەرخستن: ***( Her face told her joy.)*** .
(٦) زانین؛ پێ زانین؛ جیاکردنەوە: ***( I can ~ the difference.)*** .
(٧) بڕیاردان؛ زانین: ***( I can't ~ what to do.)*** .
(٨) پێ وتن: ***( T~ me the truth.)*** .
(٩) فەرمان پێ کردن؛ پێ وتن؛ داوالێکردن: ***( I told him to be here.)***
(١٠) سووربوون لەسەر؛ لێ دڵنیا بوون: ***( I disagree, I ~ you.)*** .
*v.i.* (١) ژماردن؛ باسکردن. (٢) نیشانەی ئەوە بوون؛ نیشاندان.
(٢) نهێنی درکاندن؛ جاڕدان؛ کارتێکردن؛ گرنگ بوون:
***( In the game of chess every move ~s.)***

**all told,** بە هەموو شتێکەوە؛ بە هەمووی؛ گشتی.

**tell off,** (١) بە دەنگی بەرز ژماردن و لێ جیاکردنەوە.
(٢) [Colloq.]، سەرزەنشتکردن.

**tell on,** (١) ماندووکردن؛ تین لێ بڕین.
(٢) [Colloq.]، جاڕ لێدان؛ خەبەر لێدان.

**tellable** (tel′ə-b'l), ***adj.*** (١) دەگێڕدرێتەوە؛ دەوترێ.
(٢) شایانی وتنە یا باسە.

**teller** (tel′ēr), ***n.*** (١) چیرۆك بێژ. (٢) ژمێرەر: (ا) دەنگ ژمێر (هەڵبژاردن).
(ب) خەزنەداری بانق؛ پارە وەرگرو بدەری بانق.

**telling** (tel′iŋ), ***adj.*** (١) توند؛ بەکار؛ کاریگەر: ***( a ~ retort)*** .
(٢) پڕ مانا؛ شت دەرخەر.

**tell-tale** (tel′tāl´), ***n.*** (١) قاوخەرەوە؛ ئابڕووبەر؛ بەدگۆ.
(٢) نیشانەی شتێکی نهێنی (٣) نیشانە: (ا) نیشانەی مەترسی لەسەر هێڵی
ئاسن. (ب) کاتژمێرێکی ئۆتۆماتیکییە بۆ تۆمارکردنی کاتی دەست بە ئیش
کردن و دەست لە ئیش هەڵگرتنی کارگەران.
***adj.*** (١) نیشاندەر؛ دەرخەر. (٢) نهێنی دەرخەر: ***( a ~ blush)*** .

**tellurian** (te-loor′i-ən, tel-yoor′i-ən), ***adj.*** سەرزەمینی؛
زەمینی.
***n.*** (١) مرۆڤی سەرزەمینی؛ زەمینی؛ دانیشتووی سەرزەمین.
(٢) **tellurion** .

**telluric** (te-loor′ik, tel-yoor′ik), ***adj.*** (١) زەمینی؛
تایبەتی بە سەرزەمین. (٢) " تلوریۆم " ی تێدایە؛ تایبەتی بە " تلوریۆم " .

**telluric acid,** ترشی تلوریۆم.

**telluride** (tel′yoo-rīd´, tel′yoo-rid), ***n.*** تلۆرید: ئاوێتەیەکی
کیمیاییە لە تلوریۆم و کانزایەك پێکدێت.

**tellurion** (te-loor′i-on´), ***n.*** *Also* **tellurian,** ئامێرێکە پیشانی
دەدات چۆن خولانەوەی زەمین دەبێتە هۆی گۆڕینی شەو و ڕۆژ و وەرزەکان.

**tellurion** (te-loor′i-on´, tel-yoor′i-on´), ***n.*** تلوریۆم:
توخمێکی کیمیایی کانزایی ڕەنگ زیوییە.

**tellurous** (tel′yoo-rəs, tel-yoor′əs), ***adj.*** تلوریۆمی؛
لە تلوریۆم وەرگیراو.

**telly** (tel′i), ***n.*** [Chiefly British Colloquial.], = **television.**

**telo-** (tel′ə), = tele-
**telo-** (tel′ə), *Also* tel-, پێشگرێکە بەمانای: کۆتایی؛ تەواوبوون؛ دوایی؛ تەواو. *( telophase)* .
**telophase** (tel′ə-fāz′), *n.* دوا قۆناغی دابەشبوونی ناڕاستەوخۆ یا دەزوویی (گیانەوەرناسی).
**telpher** (tel′fēr), *n.* گالیسکەیەکی سووکی هەڵواسراوە بەسەر تەل کارەبایدا دەڕوات.
*v.t.* بەم جۆرە گالیسکەیە گواستنەوە. (هەروەها " telfer " ) .
**telpherage** (tel′fēr-ij), *n.* گواستنەوە بە گالیسکەی هەڵواسراو بەسەر تەلی کارەباوە. (هەروەها " telferage " ) .
**telson** (tel′sən), *n.* دوا حوەکەی گیانداری جومگەیی (وەك قرژاڵو کوللەی ئاو و گیاندارە قاوغدارە ئاوییەکانی تر).
**Telestar** (tel′ə-stär′), *n.* تێلستار: مانگی دەستکرد (بۆ ناردنی بەرنامەی تەلەفزیۆنی و پەیامی تەلەفزیۆنی).
**temblor** (tem-blôr′), *n.* = earthquake.
**temerarious** (tem′ə-râr′i-əs), *adj.* سەرکێش؛ بێباك؛ هەڵەشە؛ بێ ترس
**temerity** (tə-mer′ə-ti), *n.* سەرکێشی؛ بێباکی؛ هەڵەشەیی؛ بێ ترسی
**temper** (tem′pēr), *v.t.* (١) هێمن کردنەوە؛ نەرم کردنەوە؛ خاوکردنەوە: *( to ~ justice with mercy; T~ your criticism with reason.)*
(٢) ئاودان (پۆلا)؛ ئاودانەوە؛ زاخاودانەوە؛ چاك کردن: *( Steal is ~ed by heating and sudden cooling.; Clay is ~ed by moistening and kneading.)*
(٣) [Rare]. گونجاندن؛ شیاندن.
(٤) [Archaic]. تێکەڵاوکردن بە ڕێژەی باش.
(٥) سازکردن (ئامێری مۆسیقا)؛ چاك کردنی بەرزو نزمی ئاواز.
*v.i.* هێمن بوونەوە؛ نەرم بوون؛ زاخاو درانەوە.
*n.* (١) (ا) [Archaic]. ئاوێتەی تێکەڵاوکراو بەپێی ڕێژەیەکی گونجاو. (ب) ڕەقی و نەرمی یا بەرگەگرتنی کانزا.
(٢) سروشت؛ سەر گەرمی و ساردی؛ باری هەستو هۆشو مێشك: *( He has a sweet ~. in a bad ~)*
(٣) هێمنی؛ لەسەرخۆیی: *( to lose one's ~ ; keep one's ~)* .
(٤) تووڕەوتڕۆیی؛ تەنگەجیکلانەیی؛ زوو تووڕەبوون: *( She has a ~.)* .
(٥) تووڕەیی. *( He went into a ~.)* .
(٦) شتێکە کە دەکرێتە ئاوێتەیەکەیەوە بۆ گونجاندنی.
(٧) [Archaic]. مام ناوەندی؛ میانڕەوی.
(٨) [Obs.]. (ا) جۆنێتی؛ تایبەخۆ. (ب) جۆنێتی لەش.
**tempera** (tem′pēr-ə), *n.* (١) جۆرێکە لە وێنەکێشان بریتییە لە تێکەڵ کردنی بۆیەو ماددەی لینج وەك زەردێنەی هێلکە.
(٢) بۆیەی وەها بەکارهێنراو. (٣) وێنەیەکە بەم بۆیەیە کرابێ.
**temperament** (tem′prə-mənt), *n.* (١) تێکەڵاوکردنی هارتایی.
(٢) سرووشت؛ سەر گەرمی و ساردی؛ باری هەستو هۆشو مێشك: *( He has an excitable ~.)*
(٣) سرووشتی تایبەتی (بەتایبەتی یاخێتی)؛ حولحولێتی؛ هەوەسبازی: *( Many artists have ~.)*
(٤) [Obs.]. (ا) ئاووهەوا. (ب) پلەی گەرما.
**temperamental** (tem′prə-men′t'l), *adj.* (١) تایبەتی بە سرووشتی مرۆڤ؛ هی سەر گەرمی و ساردی. (٢) تووڕەوتڕۆ؛ سەرگەرم؛ تەنگەجیکلانە؛ شێتەوڕێرە؛ کەللەشەق؛ زووهەڵچوو؛ توند.
**temperamentally** (tem′prə-men′t'l-i), *adv.* لەرووی سرووشتەوە؛ لەرووی سەرگەرمی و ساردییەوە: *( He is ~ unsuited for leadership.)*
**temperance** (tem′pēr-əns, tem′prəns), *n.* (١) ناوەندێتی؛ جڵەو بۆ خۆ شل نەکردن؛ میانڕەوی (لە ڕەفتارو ڕابواردندا)؛ مام ناوەندێتی.
(٢) کەم خواردنو خواردنەوە (بەتایبەتی مەی). (٣) عەرەق نەخواردنەوە.
**temperate** (tem′pēr-it, tem′prit), *adj.* (١) مام ناوەندی (لە خواردنو خواردنەوەو ڕەفتاردا)؛ خۆگر؛ دان بە خۆدا گر؛ عەرەق نەخۆر؛ عەرەق کەم خۆر. (٢) هێمن؛ لەسەرخۆ. (٣) مام ناوەندی.
(٤) مام ناوەندی (ئاووهەوا)؛ نە گەرمو نە سارد؛ خۆش.
**temperature** (tem′prə-chēr, tem′pēr-ə-chēr), *n.* (١) پلەی گەرمی. (٢) (ا) پلەی گەرمی ئاسایی لەش. (ب) تا؛ پلەی گەرمی بەرزی لەش
(٣) [Obs.]، (ا) مام ناوەندێتی (ئاووهەوا).
(ب) سرووشتی مرۆڤ؛ سەر گەرمی و ساردی.
**temperature gardient,** ڕێژەی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی بەپێی بەرزبوونەوە لە ئاستی دەریاوە.
**tempered** (tem′pērd), *adj.* (١) ئاودراو (پۆلا)؛ نەرم؛ زاخاودراو: *( ~ steel)*
(٢) هێمن؛ قاڵ؛ مام ناوەندی: *( ~ boldness)* .
(٣) سرووشتێکی تایبەتی هەیە؛ سەر گەرم یا ساردە: *( He is bad- ~.)*
(٤) سازکراو (مۆسیقا).
**tempest** (tem′pist), *n.* (١) گەردەلول؛ باوبۆران؛ گێژەڵووکەی دەریا.
(٢) هەراوهوریا؛ ژاوەژاو؛ پشێوی؛ بگرەوبەردە.
**tempestuous** (tem-pes′chōō-əs), *adj.* (١) گەردەلولی؛ لە گێژەڵووکەی دەریا دەچێت. (٢) ئاشوباوی؛ توندوتیژ؛ شەڕوشۆڕاوی.
*( a ~ meeting, relationship, etc.)*
**Templar** (tem′plēr), *n.* (١) ئەندامی " Knight Templar " (ئەم ووشەیە ببینە). (٢) [T-]، پارێزگار یا قوتابی دانشگای یاسا لە لەندەن.
(٣) ئەندامی ڕێکخراوێکی ماسۆنییە.
**template** (tem′plit), *n. Also* templet, (١) نەخشە؛ قاڵب.
(٢) (ا) پارچە دارێك یا بەردێکە دەخرێتە ژێر تیرگەیەکەوە بۆ دابەشکردنی قورسایی. (ب) دەستەکێکی کورت؛ پارچە دارێکی وەك دەستەك.
**temple** (tem′p'l), *n.* (١) پەرستگا؛ بتخانە. (٢) کەنیشتە.
(٣) کڵێسە. (٤) [T-]، مەڵبەندی کۆمەڵە یاساییەکانی لەندەن.
(٥) خانوویەکی جوانو گەورە؛ کۆشك: *( a ~ of art)* .
**temple** (tem′p'l), *n.* لاجانگ.
**temple** (tem′p'l), *n.* ئامێری ڕاگرتنی قوماش بە ڕێكوپێکی لە کاتی چنینیدا بە تەون.
**templet** (tem′plit), *n.* = template.
**tempo** (tem′pō), *n.* (١) خێرایی ئاوازی مۆسیقا یا گۆرانی.
(٢) پلەی چالاکی یا خێرایی؛ خێرایی و هێواشی ژیان: *( the ~ of modern living)*
**temporal** (tem′pēr-əl), *adj.* (١) سەردەمی؛ کاتی؛ کورت.
(٢) سەرزەمینی؛ تایبەتی بەم جیهانە؛ ماددی. (٣) ئاناینی؛ دنیایی؛ جیهانی
(٤) تایبەتی بە کات نەك جێگە.
(٥) تایبەتی بە کات (ڕێزمان)؛ کات پیشاندەر.
*n.* (١) (*pl.*) ، شتی کاتی یا سەردەمی.
(٢) (*pl.*)، سەرمایە یا داهاتی سەردەمی کڵێسە.
**temporal** (tem′pēr-əl), *adj.* لاجانگی.
**temporal bone,** ئێسقانی لاجانگ.
**temporality** (tem′pə-ral′ə-ti), *n.* (١) سەردەمێتی؛ کاتێتی؛ کورتێتی. (٢) (*pl.*)، سەرمایەو داهاتی سەردەمیی کڵێسە.
(٣) جەماوەری خەڵك جگە لە قەشەو پیاوانی کڵێسە.
**temporarily** (tem′pə-rer′ə-li), *adv.* بۆ سەردەمێك؛ بۆ ماوەیەکی کەم یا کورت.
**temporary** (tem′pə-rer′i), *adj.* سەردەمی؛ کاتی.
-temporariness *(n.)*.
**temporize** (tem′pə-rīz′), *v.t.* (١) بەپێی ڕۆژگار جوڵانەوە؛ ملکەچ کردن بۆ باری سەردەمی ژیان؛ لەگەڵ ڕۆژگاردا گونجان.
(٢) شت بە قنگدا خستن بۆ کات بردنە سەر؛ درێژە بە گفتوگۆدانو بڕیار

دواخستن بۆ خۆ لادان له شەڕو ناکۆکی.

-**temporization** *(n.)*.

**tempt** (tempt), *v.t.* (١) تاقیکردنەوە. (٢) فریودان؛ لاسدان؛ دان بۆ ڕۆکردن؛ هەڵفریواندن. (٣) ئارەزوو جولاّندن؛ دڵ بۆ لێدان. (٤) مەیل هەبوون؛ وا لێ هاتن؛ والێکردن. (٥) خۆ دان به دەم مەترسی‌یەوە؛ پڕکێشی کردن؛ خۆ له قەرەی کاری پڕ مەترسی دان

**temptation** (temp-tā′shən), *n.* (١) فریودان؛ لاسدان؛ دان بۆ ڕۆکردن؛ هەڵفریواندن. (٢) شتی فریودەر؛ شتی دڵرفێن یا فریوێن.

**tempter** (temp′tēr), *n.* فریودەر.

**the Tempter,** شەیتان.

**tempting** (temp′tiŋ), *adj.* فریوێن؛ دڵرفێن؛ ئارەزوو هەڵسێن.

**temptress** (temp′tris), *n.* ژنی فریودەر (بۆ جووت بوون).

**ten** (ten), *n.* (١) دە. (٢) دە کەس یا شت؛ کۆمەڵێکی دەیی. (٣) دەهەم؛ دەیەم؛ دەیەمین. (٤) دەلۆ (کاغەزی قومارو یاری). (٥) [Colloq.]، دە دۆلاری؛ دە دۆلار.

**tenable** (ten′ə-b'l), *adj.* (١) دەپارێزرێ (سەنگەر، قەڵا، جێ)؛ دەتوانرێ پارێزگاری بکرێ. (٢) بەجێ (بیروباوەڕ)؛ پشتگیری دەکرێ.

-**tenability** *(n.)*.

**tenace** (ten′ās), *n.* دوو کاغەزی گرنگ هاتنە دەستی یاریکەرێك.

**tenacious** (ti-nā′shəs), *adj.*. (١) توند؛ قایم؛ بەرنەدەر: *( a ~ grip)*. (٢) تیژ (بیر)؛ لەبیر نەچووەوە: *( a ~ memory)*. (٣) پتەو؛ سەخت؛ جیڕ: *( ~ wood)*. (٤) سرێشاوی؛ لینج. (٥) کۆڵنەدەر؛ وازنەهێنەر؛ نەبەز: *( ~ courage)*.

-**tenaciously** *(adv.)*; **tenaciousness** *(n.)*.

**tenacity** (ti-nas′ə-ti), *n.* (١) توندی؛ قایمی؛ بەهێزی. (٢) پتەوی؛ سەختی؛ جیڕی. (٣) کۆڵ نەدان؛ وازنەهێنان.

**tenaculum** (ti-nak′yoo-ləm), *n.* قولاپی نەشتەرگەری.

**tenancy** (ten′ən-si), *n.* (١) بە کرێ گرتن؛ کرێ گرتەیی. (٢) خانوو یا زەوی بە کرێ گیراو؛ خانوو یا زەوی کرێ گرتە. (٣) ماوەی ئەم بە کرێ گرتنە. (٤) خانوو یـ زەوی بە دەستەوە بوون بە خاوەنێتی بێ یا بە کرێچێتی.

**tenant** (ten′ənt), *n.* (١) کرێچی؛ کرێ گرتە. (٢) تێدا دانیشتوو؛ نیشتەنی. (٣) کەسێکە کە خانوو یا زەوی بە دەستەوە بێ بە خاوەنێتی بێ یا بە کرێچێتی.

*v.t.* بە کرێ گرتن؛ تێدا دانیشتن (خانوو).

**tenantable** (ten′ənt-ə-b'l), *adj.* بە کرێ دەدرێ؛ بۆ بە کرێدان دەشێت.

**tenant farmer,** کشتکاری کرێ گرتە؛ وەرزێرێکە زەوی بە پارە بە کرێ بگرێ یا بەشێك لە بەرهەمی زەوی‌یەکە بداتە خاوەنەکەی.

**tenantry** (ten′ənt-ri), *n.* (١) کرێچی‌یان؛ کرێ گرتەیان. (٢) کرێچێتی؛ کرێ گرتەیی.

**ten-cent store,** = five-and-ten-cent store.

**tench** (tench), *n.* ماسی‌یەکی ڕووباری ئەورووپایی‌یە.

**Ten commandments,** دە فەرمانەکە (کە خودا ناردی بۆ جوولەکە بە موسادا بەپێی ئینجیل).

**tend** (tend), *v.t.* چاودێری کردن؛ سەرەوکاری کردن؛ خەریك بوون:
*( A shepherd ~s sheep.; They ~ the store.; to ~ a child)*

*v.i.* [Colloq.], سەرنج پێدان.

**tend on,** بەردەستی کردن؛ خزمەت کردن.

**tend** (tend), *v.i.* (١) چوون بەرەو؛ ڕۆیشتن بۆ:
*( The road ~s south.)*
(٢) بەرەو ئامانجێکی تایبەتی چوون؛ ئەنجامی تایبەتی بوون:
*( War ~s to defeat its purposes.)*
(٣) بە لایەکدا داتاشین؛ مەیلێکی تایبەتی هەبوون:
*( He ~s to exaggerate. She ~s towards selfishness.)*

**tendance** (ten′dəns), *n.* (١) سەرپەرشتی؛ چاودێری. (٢) [Obs.]، بەردەستان؛ خزمەتکاران.

**tendancy** (ten′dən-si), *n.* (١) بە لایەکدا داتاشین؛ لایەنگری؛ مەیل؛ حەزی زگماکی؛ ئارەزووی سرووشتی:
*( He has a ~ to repeat himself.)*
(٢) مەبەست؛ ئامانج.

**tendentious** (ten-den′shəs), *adj.* *Also* **tendencious,** لایەنگر؛ پشتگیریکەری هەڵوێستێکی تایبەتی؛ بانگ بۆ هەڵدەر: *( ~ writings)*.

**tender** (ten′dēr), *adj.* (١) ناسك (خواردەمەنی)؛ نەرم؛ گوڵ بە دەم. (٢) ناسك؛ لاواز؛ بەرگە نەگر؛ بێ هێز. (٣) کاڵ‌وکرچ (تەمەن)؛ هەرزە؛ منداڵ؛ نەگەییو: *( the ~ years)*. (٤) کاڵ: *( ~ colors)*. (٥) ناسك؛ پێویست بە ووردی‌و وریایی دەکات: *( a ~ question)*. (٦) نەرم؛ ناسك؛ سووك: *( a ~ touch)*. (٧) ڕووخۆش؛ خۆشەویستانە؛ هی خۆشەویستی: *( a ~ smile)*. (٨) بەتەنگەوەهاتوو. (٩) ڕەزیل؛ دەست قوچاو؛ بەرچاوتەنگ. (١٠) زوو ئازاری دەبێ؛ ناسك (برینی تازە): *( ~ skin)*. (١١) هەست ناسك. (١٢) دڵ نەرم؛ بە بەزەیی.

*v.i.* (١) ناسك کردن؛ نەرم کردن. (٢) [Archaic]، بە ناسکی لەگەڵ جولاّنەوە.

-**tenderly** *(adv.)*; **tenderness** *(n.)*.

**tender** (ten′dēr), *v.t.* (١) پێشکەش کردن (بۆ دانەوەی قەرزێك یا چاکەیەك یا ئەرکێکی سەرشان). (٢) پێشکەش کردن (بۆ پەسەندکردن)؛ دان:
*( He ~ed his resignation.)*

*n.* (١) پێشکەشی پارە یا شت (بۆ قەرز یا چاکە دانەوە). (٢) پێشکەشی ڕەسمی (ژن خواستن، قۆنتەرات)؛ تێندەر:
*( She accepted his ~ of marriage.)*

**tender** (ten′dēr), *n.* (١) سەرپەرشت؛ چاودێر؛ سەرپەرشتیار. (٢) کەشتی‌یەکی بچووکە شتومەك دەگەیەنێ بە کەشتی‌یەکی گەورە. (٣) بەلەمی گواستنەوە لە نێوان کەشتی‌یەك‌و کەناری دەریادا. (٤) فارگۆنی خەڵووزو ئاوی شەمەندەفەر.

**tenderfoot** (ten′dēr-foot′), *n.* (١) کەسێکی تازە هاتوو بۆ ناوچەیەك (بەتایبەتی ناوچەی تازە ئاوەدانکراوە)؛ شلە شاری. (٢) تازەکار؛ نەشارەزا؛ نەوکار. (٣) ئەندامی تازەی دیدەوانی.

-**tenderfooted** *(adj.)*.

**tenderhearted** (ten′dēr-här′tid), *adj.* دڵ نەرم؛ بە بەزەیی؛ بەڕەحم.

-**tenderheartedly** *(adv.)*; **tenderheartedness** *(n.)*.

**tenderize** (ten′dēr-īz′), *v.t.* گۆشت ناسك کردن (بە داودەرمانی تایبەتی پێش لێنانی).

**tenderizer** (ten′dēr-īz′ēr), *n.* داودەرمانی گۆشت ناسککەر (دەکرێ بە گۆشتەوە پێش لێنانی). (هەروەها " meat tenderizer ").

**tenderloin** (ten′dēr-loin′), *n.* (١) گۆشتی پشتەمەغزە. (٢) (ا) [T-]، گەڕەکێکی شاری " نیویۆرك " ە، زوو بە خراپەکاری‌و داوێن پیسی‌و بەرتیل خواردن... هتد ناسرابوو. (ب) گەڕەکی قەحبەخانەو بەد ڕەووشتی‌و خراپەکاری.

**tender-minded** (ten′dēr-mīn′did), *adj.* خۆشبین؛ خەیاڵ پڵاو؛ خراپە نەبین.

**tendinous** (ten′di-nəs), *adj.* (١) ژێیی؛ ماسولکە ژێیی. (٢) لە ماسولکە ژێ پێکهاتوو؛ ماسولکەیی: *( a ~ tissue)*.

**tendon** (ten′dən), *n.* ژێ (تونکاری)؛ ماسولکە ژێ.

**tendrill** (ten′dril), *n.* تەرزی پیاهەڵگەڕان (ڕووەکناسی).

**tenebrific** (ten´ə-brif′ik), *adj.* (١) تاریککەر.
(٢) تاریك؛ ناخۆش؛ دڵ تەنگکەر.
**tenebrous** (ten′ə-brəs), *adj.* تاریك؛ تاریك و نووتەك؛ دڵ تەنگکەر؛ ناخۆش.
**tenement** (ten′ə-mənt), *n.* (١) خانوو یا زەوی کرێ.
(٢) ماڵ؛ خانوو؛ نشینگە. (٣) ژووری کرێ؛ چەند ژوورێکی کرێ پێکەوە.
(٤) tenament house. (٥) [Poetic]، نشینگا؛ جێی ژیان.
-tenemental; tenementary *(adj.)*.
**tenement house,** خانوویەکی زل بەش بەشی کرێیە بەتایبەتی لە گەرەکێکی هەژاری شاردا.
**tenesmus** (ti-nez′məs, ti-nes′məs), *n.* میز یا گوو زۆر هاتن بەڵام بۆ نەکران (ئەم نەخۆشییە لە " میزگیران " جیایە).
**tenet** (ten′it, tē′nit), *n.* ڕێباز؛ ڕێبازگە؛ بڕوا (بەتایبەتی هی دەستەیەکی ئایینی، فەلسەفی، یا رامیاری).
**tenfold** (ten′fōld´), *adj.* (١) دە بەشی؛ دە بەش؛ دە پارچەیی.
(٢) دە ئەوەندە.
*adv.* دە ئەوەندە.
**ten-gallon hat,** جۆرە تەپڵەیەکی قەراغ پانی کاوبۆیەکانە.
**tenia** (tē′ni-ə), *n.* = taenia.
**teniasis** (ti-nī′ə-sis), *n.* = taeniasis.
**tennis** (ten′is), *n.* تەنس؛ یاری تەنس.
**tennis court,** یاریگەی تەنس.
**tennis shoe,** پێڵاوی تەنس.
**tenon** (ten′ən), *n.* زمانە (دارتاشی).
*v.t. & v.i.* (١) بە زمانە لێکدان. (٢) زمانە بۆ کردن.
**tenor** (ten′ēr), *n.* (١) ڕێباز؛ ڕێڕەو:
*( the even ~ of his life)*
(٢) مانای گشتی؛ مەبەست: *( the ~ of his speech)*.
(٣) سرووشتی گشتی. (٤) وێنەی دەقاودەق (بەڵگەی یاسایی).
(٥) بەرزترین دەنگی پیاو لە گۆرانی ووتندا.
(٦) ئەو بەشەی بەم دەنگە بەرزە دەووترێ (گۆرانی، ئۆپەرا).
(٧) گۆرانی بێژێك یا ئامێرێکی وەها دەنگ بەرز.
*adj.* دەنگ بەرز (گۆرانی بێژ، ئامێری مۆسیقا).
**tenpence** (ten′pens´), *n.* دە پەنس؛ دە پەنسی.
**tenpenny** (ten′pen´i), *n.* (١) دە پەنسی؛ دە پەنس دەهێنێ.
(٢) بزماری سێ گرێ یا ئینجی.
**tenpenny nail,** بزماری درێژی سێ گرێ یا ئینجی.
**tenpins** (ten′pinz´), *n.pl.* (١) یارییەکە لە " بۆلینگ " دەچێ.
(٢) نیشانەیێکە لە شووشەی مل باریك دەچێ لەم یارییەدا نیشانی لێ دەگیرێتەوە.
**tenrec** (ten′rek), *n.* گیاندارێکی شیردەری جرۆجانەوەرخۆرە.
**tense** (tens), *adj.* (١) جەڕاو؛ جەڕیو؛ تورت؛ کرژ؛ توند.
(٢) دەمار کرژ؛ کرژ؛ گرژ؛ ئاڵۆز؛ ئاڵۆزاو.
*v.t. & v.i.* (١) جەڕاندن؛ جەڕان. (٢) دەمار کرژبوون؛ کرژبوون؛ ئاڵۆزان.
**tense** (tens), *n.* کات (ڕێزمان)؛ کاتی کردار (ڕێزمان).
**tensible** (ten′sə-b′l), *adj.* دەکشێت؛ دەکشێنرێت.
-tensibility *(n.)*; tensibly *(adv.)*.
**tensile** (ten′s′l, ten′sil), *adj.* (١) تایبەتی بە کرژی، توندی، یا جەڕان. (٢) tensible.
-tensility *(n.)*.
**tensile strength,** بەرهەڵستی جەڕان.
**tensimeter** (ten-sim′ə-tēr), *n.* پێوەری پاڵەپەستۆی هەڵم یا گاز. (هەروەها " manometer ")
**tensiometer** (ten´si-om′ə-tēr), *n.* پێوەری جەڕاوی یا توندی.
**tension** (ten′shən), *n.* (١) کرژی؛ توندی؛ جەڕان.
(٢) دەمارکرژی؛ گرژی؛ دەمارگیری.
(٣) ئاکۆکی (نێوان مرۆڤ یا ووڵاتان)؛ ئاڵۆزی؛ ناخۆشی:
*( T~ is rising between the two countries.)*
(٤) ئامێری توندکردنەوە یا جەڕاندن (دەزووی مەکینەی جل دوورین).
(٥) پاڵەپەستۆی کارەبا؛ پەستانی کارەبا.
(٦) هێزی هەڵم یا گاز. (٧) هێزی جەڕان، توندکردنەوە، یا ڕاکێشان
**tensity** (ten′sə-ti), *n.* کرژی؛ توندی؛ دەمارکرژی.
**tensive** (ten′siv), *adj.* کرژکەر؛ گرژکەر؛ توندکەرەوە؛ دەمار کرژکەر.
**tensor** (ten′sēr, ten′sôr), *n.* ماسولکەی کرژکەر: ماسولکەیەکە کە ئەندامێکی لەش کرژ یا تورت دەکات.
**ten-strike** (ten′strīk´), *n.* (١) لێدانێکی زۆر باش کە هەر دە نیشانەکە بخات لە یاری " tenpins " دا.
(٢) [Colloq.]، کارێکی زۆر سەرکەوتوو.
**tent** (tent), *n.* (١) چادر؛ دەوار؛ خێوەت.
(٢) چادری ئۆکسجین: چەترێکە بەسەر جێگەی نەخۆشێکەوە کە ئۆکسجینی دەدرێتێ.
*v.i.* چادر هەڵدان؛ لە دەواردا ژیان؛ خێوەت هەڵدان.
*v.t.* [Rare]، لە چادردا حەواندنەوە؛ جێ کردنەوە لە دەواردا؛ لە چادردا دانان.
**tent** (tent), *n.* تۆپەڵەیەکی سارغی یا لۆکەیە دەخرێتە برینێکەوە بۆ کردنەوەی.
**tent** (tent), *v.t.* [Scot.], (١) گوێ ڕاگرتن؛ سەرنج پێدان؛ ووریا بوون.
(٢) خزمەت کردن؛ بەردەستی کردن.
**tentacle** (ten′tə-k′l), *n.* (١) شاخی هەستداری گیانداری بێ بڕبڕە (کە بۆ هەست کردن و گرتن و خۆ پێوە نووساندن... هتد بەکاری دەهێنن).
(٢) تووکی هەستدارە بە گەڵای ڕووەکی جانەوەرخۆرەوە.
(٣) ئەندامی گرتن و هەستکردن.
-tentacular *(adj.)*.
**tentage** (ten′tij), *n.* (١) سەرجەمی چادر یا دەوار؛ چادر بەگشتی.
(٢) هەموو ئەو چادرانەی ئامادەن و لەبەردەستدان بۆ بەکارهێنان.
(٣) کەرەسەی چادر و چادر هەڵدان.
**tentative** (ten′tə-tiv), *adj.* (١) سەردەمی؛ مەرجی؛ کاتی؛ بۆ تاقیکردنەوە؛ نەبڕاوەتەوە بە تەواوی؛ ئێستا دانراوە یا کراوە بەڵام ڕەنگە لە دوایدا بگۆڕێ:
*( a ~ schedule, appointment, meeting, plan, etc.)*
(٢) دوودڵ؛ ڕاڕا؛ نادڵنیا: *( a ~ smile)*.
**tentatively** (ten′tə-tiv´li), *adv.* بە سەردەمی؛ بە نەبڕاوەیی؛ بەبێ دڵنیایی:
*( We've agreed ~ to meet with them next week.)*
**tent caterpillar,** جۆرە تەتەڵەمیرانێکی زیانبەخشە بە کۆمەڵ دەژین لە تەونی وەك چادردا بەسەر درەختەوە.
**tented** (ten′tid), *adj.* (١) بە چادر داپۆشراو؛ چادر تێدا هەڵدراو:
*( a ~ shoreline)*
(٢) چادرنشین؛ لە چادردا ژیاو.
(٣) چادری؛ لە چادر یا دەوار دەچێ.
**tenter** (ten′tēr), *n.* (١) چوارچێوەیەکە کاڵای تەنراوی لەسەر ڕادەکێشرێ پاش درووستکردنی بۆ ئەوەی نەچێتەوە یەك.
(٢) tenterhook.
*v.t. & v.i.* ڕاکێشانی کاڵا لەسەر چوارچێوەیەکی وەها.
**tenterhook** (ten′tēr-hook´), *n.* قولاپی قوماشی تازە پێ ڕاگیراو و ڕاکێشراو لەسەر چوارچێوە.
**on tenterhooks,** لە دڵەڕاوکێدا بوون؛ لە دڵەخورتێدا بوون؛ لە مەراق و دڵەلەرزێدا بوون.
**tenth** (tenth), *adj.* (١) دەیەم؛ دەهەم؛ دەیەمین. (٢) هی دەیەك؛ دەیەکی.
*n.* (١) دەیەم؛ دەهەم؛ دەیەمین. (٢) دەیەك.
**tenth-rate** (tenth-rāt′), *adj.* پلەی دەیەم؛ گەنگ؛ زۆر خراپ.
**tent-maker** (tent′māk´ēr), *n.* چادرچی؛ دەوارکەر.

**tent-stitch** (tent′stich), ***n.*** تەقەلی کوریی لابەلا (نەقشکاری).
**tenuis** (ten′ū-is), ***n.*** تیپێکی بێ دەنگە کە لە کاتی پرتاندنیدا هەوا هاتوچۆ ناکات لە دەمدا وەك: **k, t, p** (دەنگناسی) .
**tenuity** (ten-ū′ə-ti, ti-nōō′ə-ti), ***n.*** (۱) (ا) باریکی؛ تەنکی. (ب) ناسکی (ج) ناپتەوی. (د) کەمی.
(۲) بێ غیرەتی؛ بوودەڵەیی؛ بێ زەبری.
**tenuous** (ten′ū-əs), ***adj.*** (۱) ناسك؛ تەنك؛ باریك:
***( the ~ web of a spider)***
(۲) تەنك؛ سووك ***( The air at great attitudes is ~ .)*** .
(۳) (ا) هیچ‌وپووچ؛ لاواز: ***( a ~ argument)*** .
(ب) شلۆق: ناپتەو ***( a ~ relationship)*** .
**tenure** (ten′yēr), ***n.*** (۱) خاوەنێتی؛ تاپۆ بەدەستەوە بوون.
(۲) مافی خاوەنێتی؛ مافی هەبوون.
(۳) ماوەی حاوەنێتی؛ ماوەی بەدەستەوە بوون؛ ماوەی مانەوە لەسەر کار:
***( The ~ of office of an American president is four years.)***
(٤) مەرجی خاوەنێتی؛ مەرجی بەدەستەوە بوون.
(٥) جێگیربوون لەسەر کار (بەتایبەتی مامۆستای زانکۆ؛ چەسپانی مامۆستا لەسەر کار
***( Some of our professors have ~ and some don't.)***
**-tenurial** ***(adj.).***
**teocalli** (tē′ə-kal′li, tā′ə-käl′yi), ***n.*** پەرستگایەکی مەکسیکی یا ئەمەریکای لاتینی‌یە بە تەوقەسەری تەپۆلکەیەکی قووچکەیی‌یەوە.
**teosinte** (tē′ə-sin′ti), ***n.*** گیایەکی بەرزی مەکسیکی‌یە لە توخمی گەنمەشامی بۆ ئالیك بەکاردەهێنرێ.
**tepee** (tē′pē), ***n.*** *Also* **teepee,** چادری قووچکەیی لە پێست درووستکراوی هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکانە.
**tepefy** (tep′ə-fī′), ***v.t.*** شلەتێن کردن.
***v.i.*** شلەتێن بوون.
**tepid** (tep′id), ***adj.*** (۱) شلەتێن
(۲) سارد؛ نابەدڵ؛ کەم؛ بێ پەرۆش: ***( a ~ interest)*** .
**-tepidity** ***(n.)***; **tepidness** ***(n.)***; **tepidly** ***(adv.).***
**tequila** (ti-kē′lä), ***n.*** تەکیلە: (ا) رووەکێکی مەکسیکی‌یە.
(ب) خواردنەوەیەکی مەستکەرە لە قەدی ئەم رووەکە دروست دەکرێ.
**ter-** (ter), پێشگرێکە بەمانای: سێ؛ سێ‌یەك؛ سێ ئەوەندە:
***( tercentenary)***
**teraphim** (ter′ə-fim), ***n.pl.*** بتە بچووکەکانی ئەتەوە سامی‌یەکانی کۆنە (کە بە خودا دادەنران).
**terato-** (ter′ə-tō, ter′ə-tə), پێشگرێکە بەمانای: دەعبا؛ سەیرو ناشرین ***( teratology)*** .
**teratoid** (ter′ə-toid′), ***adj.*** دەعبایی: لە دەعبا دەچێ.
**teratology** (ter′ə-tol′ɔ-ji), ***n.*** لێکۆڵینەوەی گیانداری شێوە تێکچووی لە دەعباچوو.
**-teratological** ***(adj.).***
**teratoma** (ter′ə-tō′mə), ***n.*** ئاوساوی یا برینێکە لە شانەی جۆراوجۆر پێکهاتووە.
**terbium** (tūr′bi-əm), ***n.*** تربیوم: توخمێکی کانزایی کیمیاگەری‌یە.
**tercel** (tūr′s'l), ***n.*** باز (نێرە)
**tercentenary** (tēr-sen′tə-ner′i), ***n.*** (۱) سێ سەد ساڵ.
(۲) یادی سێ سەد ساڵە؛ ئاهەنگی یادی سێ سەد ساڵە.
***adj.*** (۱) سێ سەد ساڵی؛ تایبەتی بە سێ سەد ساڵ.
(۲) هی یادی سێ سەد ساڵە.
**tercentennial,** ***n. & adj.*** = **tercentenary.**
**tercet** (tūr′sit, tēr-set′), ***n.*** (۱) سێ خشتەکی؛ بڕگەی سێ دێڕی هۆنراوە (۲) سێ ئاوازی مۆسیقایە کە لە ماوەی دوو ئاوازدا لێ بدرێن. (هەروەها " **triplet** " ) .

**terebinth** (ter′ə-binth′), ***n.*** دارەبەن؛ دارقەزوان.
**terebinthine** (ter′ə-bin′thin), ***adj.*** *Also* **terebinthic,** (۱)- دارەبەنی؛ دارقەزوانی. (۲) تەرپەنتینی؛ لە ماددەی " تەرپەنتین " دەچێ؛ تایبەتی بە " تەرپەنتین "
**teredo** (te-rē′dō), ***n.*** = **shipworm.**
**terete** (tə-rēt′, ter′ēt), ***adj.*** لوولەکی و هەر دووسەر تیژو ساف.
**tergal** (tūr′g'l), ***adj.*** تایبەتی بە پشت
**tergiversate** (tūr′ji-vēr-sāt′), ***v.i.*** (۱) هەڵگەرانەوە (لە ئاین و بیروباوەڕو حیزب)؛ دەستبەردار بوون؛ وازهێنان. (۲) ئاین‌وئۆین کردن؛ قسە نەدان بەدەستەوە؛ دووزبانی کردن.
**-tergiversation** ***(n.).***
**tergum** (tūr′gəm), ***n.*** پشت (گیانەوەرناسی).
**term** (tūrm), ***n.*** (۱) (ا) ماوە؛ ماوەیەکی تایبەتی؛ وەرز؛ کەژ.
(ب) ماوەی لەسەر کار مانەوە: ***( a six-year ~ as senator)***
(ج) وەرزی قوتابخانە یا دادگا: ***( the spring ~ at school)*** .
(۲) (ا) کاتی دەستپێکردن یا دوایی هاتنی ماوەیەك.
(ب) ڕۆژی دانەوە؛ دوا کات (قەرزدانەوە).
(ج) کۆتایی سکپڕی ئاسایی؛ دوایی؛ پایان: ***( to carry a foetus to ~ )*** .
(۳) ***(pl.)***، مەرج (ڕێککەوتن، پەیمان، ئاڵ‌و وێر... هتد):
***( the ~s of a treaty; to get a contract on easy ~s)***
(٤) ***(pl.)***، (ا) پەیوەندی دوولایی یا بەرامبەر.
(ب) پەیوەندی هاوتایی
(٥) زاراوە؛ زاراوەی تایبەت بە ڕشتەیەك:
***( a scientific ~ ; a medical ~ )***
(٦) ***(pl.)***، ووتەی بەکارهێنراو بە زاراوەیەکی تایبەتی:
***( He spoke of her in derogatory ~s.)***
(۷) [Archaic or Rare]، سنوور؛ ئەوپەڕ.
(۸) ***(pl.)***، [Obs.]، بار؛ هەل‌ومەرج.
(۹) (ا) ماوەی گرتن یا بەستنی دادگا.
(ب) ماوەی بەدەستەوەبوونی خانوو یا زەوی‌وزار.
(ج) ئەم خانوو یا زەوی‌وزارە. (د) ماوەی قەرزدانەوە.
(۱۰) تای تەرازووی دوو بیری هاوپەیوەندی (ژیربێژی).
(۱۱) (ا) تای کەرت (بیرکاری). (ب) تاکی زنجیرە. (ج) تای جەبری.
***v.t.*** پێ ووتن؛ وا پێ ووتن؛ ناونان.
**be on bad terms with,** ناکۆك بوون؛ ناڕێك بوون لەگەڵ.
**be on good terms with,** کۆك بوون؛ ڕێك بوون لەگەڵ.
**bring to terms,** بە زۆر ڕازی کردن؛ بە زۆر ڕێکخستن؛ بە زۆر پێ کردن.
**come to terms,** ڕێککەوتن.
**in terms of,** لە ڕووی؛ لە لایەن:
***( He thinks of everything in terms of money.)***
**make terms,** ڕێککەوتن.
**termagant** (tūr′mə-gənt), ***n.*** = **shrew.**
***adj.*** شەڕەنگێز؛ بێ حەیا؛ زمان پیس؛ تووڕەوتڕۆ.
**-termagancy** ***(n.).***
**term day,** ڕۆژی دانەوە (قەرز).
**termer** (tūr′mēr), ***n.*** (۱) ئەو کەسەی ماوەیەك دەباتە سەر لە شوێنێکدا بەتایبەتی لە بەندیخانەدا؛ بەندکراوێك بۆ ئەوەندە جار: ***( a third- ~ )*** .
(۲) [Obs.]، **termor** .
**terminable** (tūr′mi-nə-b'l), ***adj.*** (۱) کۆتایی پێ دێت؛ دەتوانرێ دوایی پێ بهێنرێ. (۲) کۆتایی دێت پاش ماوەیەکی تایبەتی (قۆنتەرات).
**-terminability** ***(n.).***
**terminal** (tūr′mə-n'l), ***adj.*** (۱) دوا؛ هی دوایی؛ هەرە دوا.
(۲) وەرزی؛ وەرزانە: ***( a ~ examination)*** .
(۳) هی دوا ئێستگەی شەمەندەفەر.

(٤) سەرلقی؛ سەرتەرزی: *( a ~ leaflet)* .
(٥) کوشندە؛ بێ دەرمان؛ بێ چارە؛ دوایی پێ هێن:
*( a ~ disease; ~ cancer)*
***n.*** (١) سەر؛ جەمسەر؛ لا؛ دوایی؛ پایان؛ کۆتایی.
(٢) ئێستگەی کۆتایی و سەرەتا (شەمەندەفەر، پاس، فرۆکە)؛ دوا ئێستگە؛ ئێستگەی ئەم سەرو ئەوسەر.
**-terminally** ***(adv.).***
**terminal leave,** دوا ورجانی ئەفسەر یا سەرباز پێش لێ خستنی
**terminate** (tûr′mə-nāt′), ***v.t.*** کۆتایی پێ هێنان؛ دوایی پێ هێنان؛ برینەوە . *( to ~ a contract, relationship, an agreement, etc.)*
***v.i.*** دوایی پێ هاتن؛ کۆتایی پێ هاتن.
**termination** (tûr′mə-nā′shən), ***n.*** (١) کۆتایی پێ هێنان؛ کۆتایی هاتن؛ دوایی هاتن؛ برینەوە. (٢) دوایی؛ کۆتایی؛ پایان. (٣) پاشبەند: دوا دەنگ یا برگەی وشە. (هەروەها " suffix " ). (٤) ئەنجام
**-terminational** ***(adj.).***
**terminative** (tûr′mə-nā′tiv), ***adj.*** کۆتایی پێ هێن؛ دوایی پێ هێن
***n.*** = suffix.
**terminator** (tûr′mə-nā′tēr), ***n.*** (١) کۆتایی پێ هێن (مرۆڤ، شت)؛ دوایی پێ هێن؛ قرتێنەر. (٢) هێڵی نێوان بەشی رووناک و تاریکی مانگ و ئەستێرەی گەڕۆک.
**terminology** (tûr′mə-nol′ə-ji), ***n.*** (١) زاراوە؛ زاراوەی رشتەیەکی تایبەتی. (٢) زانستی ئەم جۆرە زاراوەیە؛ لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە زاراوەیە.
**-terminological** ***(adj.).***
**term insurance,** بیمەی سەردەمی (دژی زیان و مردن).
**term paper,** لێکۆڵینەوەی وەرزی (کە قوتابی زانکۆ دەینووسێ)؛ باسنامەی وەرزی.
**terminus** (tûr′mə-nəs), ***n.*** (١) [Rare] . سنوور. (٢) بەرد یا نیشانەی سنوور؛ سنوور نیشانەکەر. (٣) [T-]، خودای سنوورو نیشانە (ئەفسانەی رۆمان). (٤) ئێستگەی ئەم سەرو ئەوسەر (شەمەندەفەر، پاس، فرۆکە)؛ دوا ئێستگە؛ کۆتایی ڕێگە. (٥) [Chiefly British]، شاری ئێستگەی ئەم سەرو ئەوسەر.
**territorial**
**termite** (tûr′mīt), ***n.*** مۆرانەی دارو تەختە؛ مۆریانە.
**termless** (tûrm′lis), ***adj.*** (١) بێ پایان؛ بێ سنوور. (٢) بێ مەرج
**termor** (tûr′mēr), ***n.*** کەسێک کە خانووبەرەیەکی بە دەستەوە بێ بۆ ماوەیەک یا هەتا دەمرێ.
**tern** (tûrn), ***n.*** بەرەسێلکەی دەریا: باڵندەیەکی دەریایییە لە " gull " دەچێ
**tern** (tûrn), ***n.*** (١) پیانۆزیەکە بە سێ ژمارە براێتەوە. (٢) ئەم سێ ژمارەیە. (٣) بەلەمی سێ ستوونی.
**ternary** (tûr′nēr-i), ***adj.*** (١) سێیانە؛ سێیانە؛ لە سێ بەش پێکهاتوو. (٢) سێیەم؛ سێهەم. (٣) لە سێ توخم پێکهاتوو (کیمیاگەری). (٤) هی دارشتەی لە سێ کانزا پێکهاتوو. (٥) ژێرەکەی سێیە (بیرکاری).
***n.*** [Rare]. دەستەی سێیانە؛ سێ؛ کۆمەڵی سێیی.
**ternate** (tûr′nāt), ***adj.*** (١) سێانە؛ سێیانە؛ لە سێ پێکهاتوو؛ سێ. (٢) سێ سێ؛ سێ سێ ڕیزکراو. (٣) سێیانە (گەڵا)
**terneplate** (tûrn′plāt′), ***n.*** پەڕەی ئاسن یا پۆڵای داپۆشراو بە دارشتەی تەنەکەو قورقوشم
**terpsichorean** (tûrp′si-kə-rē′ən), ***adj.*** سەمایی؛ تایبەتی بە سەما.
***n.*** سەماکەر.
**terra alba,** خاکە سپی؛ گەچ.
**terra** (ter′ə), ***n.*** [L.]. خاک؛ زەمین
**terrace** (ter′is), ***n.*** (١) تەلان؛ تەلار؛ پلە پلەی زەوی؛ لێژگەی پلە پلەکراو. (٢) هەیوان. (٣) سەربانی تەخت. (٤) ڕیزە خانووی ئەختێک لە شەقامەکە بەرزتر. (٥) شەقامی بەردەمی ڕیزە خانوویەکی وەها بەرز. (٦) باخچەی درێژکۆلەی ناوەڕاستی شەقامێک.
***v.t.*** تەلان کردن؛ پلە پلە کردن (زەوی لێژ، چیمەن، قەدپاڵ).
**terra-cotta** (ter′ə-kot′ə), ***adj.*** (١) قاوەیی سووورباو. (٢) هی قوڕی " terra cotta " (ووشەی داهاتوو ببینە).
**terra cotta,** (١) قوڕێکی قاوەیی سووورباوە گڵێنەی لێ دروست دەکرێ. (٢) گڵێنەی بەم قوڕە دروستکراو. (٣) قاوەیی سووورباو.
**terra firma,** ووشکانی؛ زەمین.
**terrain** (tə-rān′, te-rān′, ter′ān), ***n.*** (١) زەوی؛ پەلە زەوی. (٢) زەمین (لەڕووی بەرزی و نزمییەوە)؛ بەرزی و نزمی زەمین؛ جۆری زەمین. (٣) ناوچە؛ هەرێم؛ ناوچەیەکی جوگرافی. (٤) terrane .
**terra incognita** (ter′ə in-kog′ni-tə), (١) زەمینی نەدۆزراوە؛ زەمینی نەزانراو. (٢) رشتەی زانستی نەزانراو یا نەدۆزراوە.
**terramycin** (ter′ə-mī′sin), ***n.*** ترامایسین: جۆرە دەرمانێکە.
**terrane** (tə-rān′, te-rān′, ter′ān), ***n.*** (١) ڕیزە بەردی هاوچەشن (زەمینناسی). (٢) ناوچەی پڕ لە بەردێکی تایبەتی یا چەند بەردێکی هاوچەشن.
**terrapin** (ter′ə-pin), ***n.*** (١) ڕەقە؛ کیسەڵی زەلکاو؛ کیسەڵی ناو شیریناو. (٢) گۆشتی ئەم کیسەڵە.
**terraqueous** (ter-ā′kwi-əs), ***adj.*** ووشکانی ئاوی؛ لە ووشکانی و لە ناو پێکهاتوو (وەک سەرزەمین).
**terrarium** (te-rār′i-əm), ***n.*** (١) زەوییەکی دەورەگیراوە گیانداری بچووکی تێدا بەخێودەکرێ (وەک کیسەڵ و قوڕی... هتد). (٢) دەفری ڕووەکی بچووک تێدا بەخێوکردن.
**terrazzo** (ter-rät′sô), ***n.*** زەمینەی پارچە مەرمەری بچووک و چیمەنتۆ.
**terrene** (te-rēn′, ter′ēn), ***adj.*** (١) سەرزەمینی؛ زەمینی. (٢) جیهانی.
***n.*** (١) سەرزەمین. (٢) ناوچە؛ هەرێم.
**terreplein** (ter′plān′), ***n.*** سەکۆی لەسەر دابەستنی تۆپی ناو سەنگەر.
**terrestrial** (tə-res′tri-əl), ***adj.*** (١) سەرزەمینی؛ جیهانی؛ تایبەتی بەم سەرزەمینە. (٢) ووشکانی. (٣) زەمین نشین؛ ووشکانی نشین (٤) لە خاکدا ڕوواو؛ لە خاکدا پەروەردە بوو؛ خاکی.
***n.*** زەمین نشین؛ مرۆڤ؛ دانیشتوویەکی سەرزەمین.
**terret** (ter′it), ***n.*** (١) ئەڵقەی ڕستی سەگ و تانجی؛ ئەڵقەی ملبەندی سەگ. (٢) ئەڵقەی زین و قایش و قرووشی ئەسپ کە ڕەشمە و لغاوی پێدا دەکرێ.
**terrible** (ter′ə-b′l), ***adj.*** (١) سامناک؛ ترسناک؛ جەرگبڕ. (٢) ئێجگار زۆر؛ لە ئەندازە بەدەر. (٣) ناخۆش؛ خراپ؛ زۆر ناخۆش یا خراپ:
*( She had a ~ time at the party.)*
**terribly** (ter′ə-bli), ***adv.*** (١) ترسناکانە؛ سامناکانە. (٢) زۆر؛ ئێجگار زۆر: *( I'm ~ sorry.)* .
**terricolous** (te-rik′ə-ləs), ***adj.*** ووشکانی (ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی)؛ لەسەر خاک دەژی.
**terrier** (ter′i-ēr), ***n.*** تێریەر: جۆرە سەگێکی ڕاوی بچووکی زیرەکی چالاکە.
**terrier** (ter′i-ēr), ***n.*** تۆمارنامەی تاپۆی زەوی‌وزاری ناوچەیەک.
**terrific** (tə-rif′ik), ***adj.*** (١) ترسناک؛ سامناک. (٢) ناخۆش؛ بێ تاقەتکەر. (٣) نایاب؛ زۆر باش:
*( a ~ teacher, chef, dinner, view, time, etc.)*
(٤) سەرسوڕهێنەر.
**-terrifically** ***(adv.).***
**terrify** (ter′ə-fī′), ***v.t.*** تۆقاندن؛ زارەترەک کردن؛ زۆر ترساندن.

**territorial** (ter´ə-tôr′i-əl, ter´ə-tō′ri-əl), ***adj.*** (١) هەرێمی؛ ناوچەیی. (٢) تایبەتی بە دەسەڵاتی هەرێمێك.
(٣) [T-]. بەرگری؛ هی بەرگری هەرێمی: ***( the British T~ Army)*** .
***n.*** (١) سەربازی هێزی بەرگری هەرێمی.
(٢) سەربازی هێزی بەرگری هەرێمی ئینگلیزی.

**territorialism** (ter´ə-tôr′i-əl-iz'm, ter′ə-tō′ri-əl-iz'm), ***n.*** (١) رژێمی خاوەن زەوییان.
(٢) رژێمێکی کلێسەیی‌یە کە دەسەڵات تێیدا بە دەست هێزی شارستانی‌یەوەیە.

**territoriality** (ter´ə-tôr´i-al′ə-ti, ter′ə-tō′ri-al′ə-ti), ***n.*** هەرێمێتی؛ ناوچەییتی.

**territorial waters,** ئاوی هەرێمی: ئاوی کەنار دەریای وڵاتێك کە هەتا سێ میل هی ئەو وڵاتەیە.

**territory** (ter′ə-tôr´i, ter′ə-tō´ri), ***n.*** (١) هەرێم؛ ناوچە.
(٢) خاك و ئاوی وڵاتێك. (٣) هەرێمی ژێردەستە یا سەر بە وڵاتێك کە هێشتا نەبووبێ بە بەشێك لەو وڵاتە.
(٤) ناوچەی کاروکاسبی (بەتایبەتی هی فرۆشیاری گەڕۆك).
(٥) مەیدانی کار و بیرکردنەوە و چالاکی... هتد.
(٦) لایەکی گۆڕەپانە کە بە دەست تیپێکی یاری‌یەوەیە.

**terror** (ter′ēr), ***n.*** (١) ترس؛ ترسێکی ئێجگار زۆر؛ تۆقین؛ ترس‌ولەرز.
(٢) شتی ترسناك؛ کەسێکی ترسناك. (٣) ڕەش کوژی؛ تۆقاندن؛ تیرۆر.
(٤) [Colloq.]، کەسێکی بێزارکەر یا پەستکەر.

**terrorism** (ter′ēr-iz'm), ***n.*** ڕەش کوژی؛ تۆقاندن؛ تیرۆریزم.

**terrorist** (ter′ēr-ist), ***n.*** تۆقێنەر؛ ترسێنەر؛ زراوبەر؛ ڕەش کوژ؛ تیرۆریست.

**-terroristic** ***(adj.).***

**terrorize** (ter′ə-rīz´), ***v.t.*** (١) تۆقاندن؛ ترساندن؛ زارەترەك کردن.
(٢) بە زۆر پێ کردن؛ ترس ئانە بەرو پێ کردن.

**-terrorization** ***(n.).***

**terror-stricken** (ter′ēr-strik´n), ***adj.*** تۆقیو؛ زۆر ترساو؛ زارەترەك بوو.

**terry** (ter′i), ***n.*** (١) کورك؛ گەندەمووی قوماش.
(٢) قوماشی کورکاوی؛ قوماشی گەندەموودار.
(پێشی دەوروترێ: " terry cloth " ).

**terse** (tŭrs), ***adj.*** کورت (ووتە، وەڵام)؛ کورت و بەجێ: ***( a ~ reply)*** .

**-tersely** ***(adv.)***; **terseness** ***(n.).***

**tertial** (tŭr′shəl), ***adj.*** هی سێهەم ریزی پەڕی فڕین؛ هی پەڕی فڕین.
***n.*** پەڕی سێهەم ریزی فڕینی باڵندە.

**tertian** (tŭr′shən), ***adj.*** هەر ڕۆژ نە ڕۆژێ؛ هەر سێ ڕۆژ جارێك.
***n.* = tertian fever.**

**tertian fever,** نۆرەتا؛ سێبەڕۆ.

**tertiary** (tŭr′shi-er´i, tŭr′shə-ri), ***adj.*** (١) سێهەم؛ سێهەم پلە؛ سێهەمین. (٢) هی پلەی سێهەم لە پەرستگادا.
(٣) [T-]، هی چەرخی سێهەم (زەمیناسی). (٤) tertial .
***n.*** (١) ئەندامێکی پلەی سێهەمی پەرستگا. (٢) پەڕی فڕینی باڵندە.

**the Tertiary,** چەرخی سێهەم (زەمیناسی).

**tertiary color,** ڕەنگێکە لە تێکەڵ کردنی دوو ڕەنگی ناسەرەکی پێکدێت.

**tervalent** (tēr-vā′lənt), ***adj.*** سێ هاوهێزی (کیمیا).

**terza rima** (ter′tsä rē′mä), هۆنراوەیەکی سێ خشتەکی‌یە لە بنچینەدا ئیتاڵی‌یە (قافیە) کەی بەم جۆرەیە: aba, bcb, cdc .

**tessellate** (tes′ə-lāt′), ***v.t.*** کاشی بەند کردن؛ نەخشاندن بە کاشی و شووشە و بەردی هەمەڕەنگ.

**-tessellation** ***(n.).***

**tessera** (tes′ēr-ə), ***n.*** پارچە تەختە، کاشی، شووشە یا بەردی مەرمەری بچووك (لە نەخشکاریدا بەکاردەهێنرێ).

**test** (test), ***n.*** (١) cupel . (٢) تاقیکردنەوە؛ ئەزموون.
(٣) پێوان؛ پێوەر.
***v.t.*** (١) کانزا پوختەکردن؛ جیاکردنەوەی کانزای بەنرخ لە هی بێ نرخ
(٢) تاقیکردنەوە.

**test** (test), ***n.*** قاوغی گیانداری ئاوی؛ لەپکە؛ قاقلە.

**testa** (tes′tə), ***n.*** (١) توێکلە تۆو. (٢) قاوغ؛ لەپکە؛ قاقلە.

**testaceous** (tes-tā′shəs), ***adj.*** (١) قاوغی؛ لەپکەیی؛ قاقلەیی.
(٢) قاوغدار؛ قاقلەدار. (٣) قاوەیی سوورباو.

**testacy** (tes′tə-si), ***n.*** وەسیەتنامە لە دوای خۆ بەجێهێشتن.

**testament** (tes′tə-mənt), ***n.*** (١) پەیمان.
(٢) [T-]، یەکێکە لە دوو بەشەکەی ئینجیل (کە پێیان دەووترێ: " the Old Testament " و " the New Testament " ).
(٣) [T-]، [Colloq.]، بەشی دووەمی ئینجیل " The New Testament ".
(٤) وەسیەتنامە: ***( his last will and ~ )*** .

**testamentary** (tes′tə-men′tə-ri), ***adj.*** (١) وەسیەتنامەیی؛ تایبەتی بە وەسیەتنامە. (٢) لە وەسیەتنامەدا بۆی دانراوە یا دراویەتێ.
(٣) بەپێی وەسیەتنامە کراوە.

**testate** (tes′tāt), ***adj.*** وەسیەتنامە لە دوا بەجێماو.
***n.*** وەسیەتنامە بەجێهێشتوو.

**testator** (tes′tā-tēr, tes-tā′tēr), ***n.*** وەسیەتنامە بەجێهێشتوو؛ مردوویەکی وەسیەتنامە بەجێهێشتوو.

**testatrix** (tes-tā′triks), ***n.*** ژنێکی وەسیەتنامە بەجێهێشتوو.

**tester** (tes′tēr), ***n.*** تاقیکەرەوە.

**tester** (tes′tēr), ***n.*** چەتری سەر جێگا.

**testes** (tes′tēz), ***n. plural of*** **testis.**

**testicle** (tes′ti-k'l), ***n.*** گون.

**testiculate** (tes-tik′yoo-lit), ***adj. Also*** **testicular,** گونی؛ لە گون دەچێ؛ هێلکەیی.

**testify** (tes′tə-fī′), ***v.i.*** (١) شایەتی دان (دادگا)؛ گەواهی دان:
***( to ~ in court)***
(٢) بەڵگە بوون بۆ؛ نیشانەی ئەوە بوون:
***( His words ~ to his impatience.)***
***v.t.*** (١) شایەتی بۆ دان؛ گەواهی بۆ دان. (٢) بەڵگە بوون بۆ. (٣) بانگ بۆ دان.

**-testification** ***(n.)***; **testifier** ***(n.).***

**testily** (tes′t'l-i), ***adv.*** بە تووڕەیی‌یەوە؛ بە تووڕەو تڕۆیانەوە؛ بە تەنگەجیکلانەوە.

**testimonial** (tes′tə-mō′ni-əl), ***n.*** (١) پەسەندنامە؛ گەواهی؛ گەواهنامە. (٢) خەڵات (بەتایبەتی کە لە کۆمەڵێکەوە پێشکەشی کەسێك بکرێ بە ئاشکرا بۆ ئیش‌وکاری بەسوودی)؛ ڕێزنامە؛ سوپاسنامە

**testimony** (tes′tə-mō´ni), ***n.*** (١) شایەتنامە؛ شایەتی؛ گەواهنامە؛ گەواهی (دادگا). (٢) بانگ.
(٣) بەڵگەنامە؛ بەڵگە؛ قەواڵە: ***( His smile was ~ to his disbelief.)***
(٤) [T-]، فەرموودەی خودایی (ئینجیل).
(٥) بڕوا پێ کردنی ئاشکراو جاڕ بۆ دانی (ئاین).

**testis** (tes′tis), ***n.* = testicle.**

**teston** (tes′t'n), ***n. Also*** **testoon,** دراوێکی ئینگلیزی و فەرەنسی کۆنە.

**testosterone** (tes-tos′tə-rōn´), ***n.*** تێستۆستەرۆن: هۆرمۆنێکە گون دەریدەدات.

**test paper,** (١) کاغەزی تاقیکردنەوە. (٢) کاغەزی ئەزموون (کیمیا).

**test pilot,** فڕۆکەوانی تاقیکەرەوە: فڕۆکەوانێکە فڕۆکەی تازە تاقی دەکاتەوە.

**test tube,** بۆری ئەزموون؛ بۆری تاقیکردنەوە.

**test-tube** (test′tōōb, test′tūb), ***adj.*** لە چاکردنی دەستکرد پەیدا بووە: ***( a ~ baby)*** .

**testudinal** (tes-tōō′də-n'l, tes-tū′də-n'l), *adj.* کیسەڵی؛ لە کیسەڵ و قاوغەکەی دەچێ

**testudinarious** (tes-tū′də-nâr′i-əs), *adj.* = testudinal.

**testudinate** (tes-tōō′də-nāt′, tes-tū′də-nit), *adj.* (١) قوقز؛ وەك قاوغی کیسەڵ. (٢) کیسەڵی.
*n.* کیسەڵ رەنە.

**testudo** (tes-tōō′dō, tes-tū′dō), *n.* (١) کیسەڵ رەقە. (٢) پەناگایەکی سەربانیکی کەوانەیی دژ بە گوللەی بەسەرەوەیە دەجوڵێنری سەربازی گەمارۆدراوی رۆمانەکان بەکاریان دەهێنا (٣) پەردەیەکی پارێزەرە سەربازە رۆمانەکان دروستیان دەکرد بە لێکدانی قەڵغانەکانیان و خستنیە سەر سەریان.

**testy** (tes′ti), *adj.* تەنگەجیکڵانە؛ سەرگەرم؛ زووهەڵچوو.
**-testiness** *(n.)*.

**tetanic** (ti-tan′ik), *adj.* دەردەکوێپانی.
*n.* هەر جۆرە دەرمانێکە کە زۆر بەکارهێنانی دەبێتە هۆی دەردەکوێپان.

**tetanize** (tet′ə-nīz′), *v.t.* تووشی دەردەکوێپان کردن.

**tetanus** (tet′ə-nəs), *n.* دەردەکوێپار

**tetany** (tet′ə-ni), *n.* نەخۆشی‌یەکە لە دەردەکوێپان دەچێ.

**tetchy** (tech′i), *adj. Also* techy, تەنگەجیکڵانە؛ سەرگەرم؛ زووهەڵچوو

**tête-à-tête** (tāt′ə-tāt′), *n.* (١) گفتوگۆی دووبەدوو؛ گفتوگۆی رووبەروو یا تایبەتی. (٢) کورسی‌یەکە لە شێوەی ( S ) دا دوو کەس لەسەری دادەنیشن.
*adj.* دووبەدوو؛ رووبەروو؛ تایبەتی: *( a ~ meeting)* .
*adv.* رووبەروو؛ دووبەدوو؛ تایبەتی‌یانە: *( They spoke ~ .)* .

**tether** (te*th*′ēr), *n.* (١) کەمەند پەت یا گوریسی وولاخ بەستنەوە. (٢) مەودا سنارەزایی، زانین، توانا، دانایی ... هتد).
*v.t.* کەمەند کردن؛ وولاخ بەستنەوە بە پەت یا گوریس

**at the end of one's tether,** ئیتر لە تینیا نەماوە؛ ئیتر لە باریا نەماوە.

**tetra** (tet′rə), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی رووباری ناوچە گەرمەکانە.

**tetra-** (tet′rə), پێشگرێکە بەمانای چوار.

**tetrad** (tet′rad), *n.* (١) ژمارە چوار (٢) کۆمەڵێك یا دەستەیەکی چواری. (٣) دەستەیەکی چوار کرۆمۆسۆمی کە لە دابەشبوونی جووتێ کرۆمۆسۆم پەیدابووبن (٤) توخمێکی کیمیایی چوار هاوهێزی.

**tetragon** (tet′rə-gon′), *n.* چوارگۆشە وێنەی چوارگۆشەیی.
**-tetragonal** *(adj.)*.

**tetragram** (tet′rə-gram′), *n.* ووشەی چوار تیپی

**tetrahedral** (tet′rə-hē′drəl), *adj.* چواررووی (ئەندازە).

**tetrahedrite** (tet′rə-hē′drīt), *n.* تێترامیدرایت: کانزایەکی بۆر یا رەشباوە.

**tetrahedron** (tet′rə-hē′drən), *n.* چوارروو (ئەندازە)؛ وێنەی چوارروو

**tetralogy** (te-tral′ə-ji), *n.* (١) زنجیرەیەکی چوار شانۆنامەیە سیانیان ناسۆزاوی و یەکێکیان لاقرتێ (٢) زنجیرەیەکی چوار شانۆنامە یا نۆیەرایە.

**tetramerous** (te-tram′ēr-əs), *adj.* (١) چوارینە؛ لە چوار بەشی چوون یەك پێکهاتووە؛ کراوە بە چوار بەشی چوون یەکەوە. (٢) چوار چوار پێکەوەن (پەرەی گوڵ یا نێرکەکەی).

**tetrameter** (te-tram′ə-tēr), *n.* دێرێکی هۆنراوەی چواربرگەیی کێشەدارە

**tetrapetalous** (tet′rə-pet′'l-əs), *adj.* چوار پەرە گوڵ

**tetrapod** (tet′rə-pod′), *n.* چوارپێ

**tetrapterous** (te-trap′tēr-əs), *adj.* چوار باڵی وەك جانەوەر).

**tetrarch** (tet′rärk, tē′trärk), *n.* (١) فەرمانڕەوای چواریەکی وولاتێك (لە ئیمپراتۆریەتی رۆمای کۆندا). (٢) شازادەی خواردەست؛ فەرمانڕەوای ناسەرەکی

**tetrarchy** (tet′rär-ki, tē′trär-ki), *n.* (١) چواریەکی وولاتێك کە لەژێر دەستی فەرمانداریکدا بێ. (٢) میری چوار کەسی. (٣) چوار فەرماندار؛ دەستەیەکی چوار میری. (٤) وولاتێکی بەشکراو بە چوار بەشەوە.

**tetrastich** (tet′rə-stik′), *n.* هەڵبەستی چوار دێری؛ برگەی چوار دێری هەڵبەستێك.

**tetrastichous** (te-tras′ti-kəs), *adj.* بە چوار ریزی ستوونی دەڕوێن (گەڵا، گوڵ).

**tetratomic** (tet′rə-tom′ik), *adj.* چوار گەردیلەیی؛ چوار ئەتۆمی.

**tetravalent** (tet′rə-vā′lənt, te-trav′ə-lənt), *adj.* چوار هاوهێزی.

**tetroxide** (te-trok′sīd, te-trok′sid), *n.* ئۆکسیدی چوارینە؛ ئۆکسیدێکە چوار گەردیلەی ئۆکسجینی تێدا بێ.

**tetryl** (tet′ril), *n.* بارودێکی زەردە.

**tetter** (tet′ēr), *n.* جۆرە نەخۆشی‌یەکی پێستە دەبێتە هۆی خوران (وەك بیرۆ).

**Teuton** (tōō′t'n, tū′t'n), *n.* (١) تیوتۆن، *(pl.)* نەتەوەیەکی ئەڵمانی کۆن. (٢) تیوتۆنی؛ ئەڵمانی؛ کەسێکی تیوتۆنی یا ئەڵمانی.

**Teutonic** (tōō-ton′ik, tū-ton′ik), *adj.* تیوتۆنی. (ووشەی پێشوو ببینە).

**Teutonism** (tōō′t'n-iz'm, tū′t'n-iz'm), *n.* (١) بڕوا بوون بە بەرزیتی نەتەوەی ئەڵمان؛ رەگەزپەرستیتی ئەڵمانی. (٢) زاراوەی ئەڵمانی. (٣) کلتووری ئەڵمانی.
**-Teutonist** *(n.)*.

**Texan** (tek′s'n), *adj.* تەکساسی.
*n.* تەکساسی؛ کەسێکی تەکساسی.

**Texas** (tek′səs), *n.* نهۆمی سەرەوەی بەلەمی هەڵم (کە ژووری ئەفسەری تێدایە).

**Texas fever,** تای تەکساسی: دەرمێکی رەشەوولاخ و ئاژەڵە.

**Texas Ranger,** پۆلیسی سوارەی تەکساسی.

**Texas tower,** بورجی تەکساس: بورجێکی رادارە لەناو دەریادا.

**text** (tekst), *n.* (١) دەق؛ دەقی ووتەی نووسەر؛ دەقی ووتەی نووسراو؛ دەقی ووتار: *( the ~ of a letter, speech, etc.)* (٢) دەقی کتێب جگە لە پەراوێز و پێشەکی و پاشکۆ. (٣) دەقی بەندێکی ئینجیل (کە دەهێنرێتەوە بۆ پشتیوانی بیروباوەڕێك یا پەندێك). (٤) دەستنووسی زل. (٥) باس. (٦) جۆرێکە لە تیپی قەڵەو کە لە چاپ کردندا بەکاردەهێنرێ. (٧) **text-book** .

**text-book** (tekst′book′), *n.* پەرتووکی قوتابخانە؛ کتێبی قوتابخانە.

**text hand,** دەستنووسی گەورە.

**textile** (teks′t'l, teks′til, teks′tīl), *adj.* (١) چنراو؛ تەنراو. (٢) هی چنراو. (٣) دەچنرێ؛ بۆ چنین دەشێ.
*n.* (١) کاڵا؛ قوماش؛ کوتاڵ؛ چنراو. (٢) کەرەسەی خاوی چنین (وەك لۆکە، خوری، کەتان).

**textual** (teks′chōō-əl), *adj.* (١) دەقی؛ هی دەقی نووسراو یا کتێب. (٢) ووشە بە ووشە؛ بەپێی دەقی نووسراو.

**textual criticism,** رەخنەلێگرتن و شیکردنەوەی دەقی کتێب یا نووسراو.

**textualism** (teks′chōō-əl-iz'm), *n.* (١) دەق پەرستی (ئینجیل). (٢) رەخنە لێ گرتن و شیکردنەوەی دەقی کتێب (بەتایبەتی ئینجیل).
**-textualist** *(n.)*.

**textuary** (teks′chōō-er′i), *adj.* دەق؛ هی دەقی کتێب یا نووسراو.
*n.* دەق پەرست (بەتایبەتی ئینجیل). (هەروەها " textualist " ) .

**texture** (teks′chēr), *n.* (١) کاڵا؛ قوماش؛ چنراو

(٢) چونێتی کالاّ یا چنراوێك: *( a fine ~ ; a coarse ~ )* .
(٣) دەق: شێوەی دەق بەستن یا خۆگرتن؛ توندوتۆلی؛ شێوەی وەستان یا پێکهاتن. (٤) شێوەی پێکهاتن؛ پێکهاتن.

**-th,** پاشگرێکە بەمانای: (ا) کردن؛ کردار: *(stealth)* .
(ب) هەبوون؛ بوون: *(wealth)* .

**-th,** پاشگرێکە بەمانای: ئەوەندەهەم؛ نیشانەی ژمارەی پلەژمێرە: *(fourth, seventh, tenth)*

**-th,** پاشگرێکە نیشانەی کرداری کەسی سێهەمی تاکە لە کاتی ئێستادا: *(hath, doth)*

**thalamencephalon** (thal´ə-men-sef′ə-lon´), *n.* بەشی پشتەوەی پێشی مێشکی ئاوڵەمە.

**thalamus** (thal′ə-məs), *n.* (١) تەختی مێشك؛ بنکی مێشك. (٢) تەختی گوڵ.

-thalamic *(adj.).*

**thalassic** (thə-las′ik), *adj.* (١) دەریایی؛ زەریایی. (٢) کەنداوی: هی دەریای بچووکی بە ووشکانی دەورەدراو.

**Thalia** (thā′li-ə, thāl′yə), *n.* (١) بانوخوای هۆنراوەی لادێ‌و چیرۆکی پێکەنیناوی (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) یەکێکە لە سێ بانوخوا جوانەکە کە جوانی‌یان دەبەخشی بە هەموو کەس (ئەفسانەی یۆنانی).

**thallic** (thal′ik), *adj.* تالیۆمی (ووشەی داهاتوو ببینە).

**thallium** (thal′i-əm), *n.* تالیوم توخمێکی کیمیایی کانزایی خوڵەمێشی‌یە.

**thallophyte** (thal′ə-fīt´), *n.* یەکێکە لە کۆمەڵە ڕووەکێکی بێ گەڵاو ڕەگو قەدی دیار (وەك قەوزەو قارچك).

**thallous** (thal′əs), *adj.* تالیۆمی: هی ئاوێتەیەکی کیمیایی کە تالیۆمی یەك هاوهێزی تێدا بێت.

**thallus** (thal′əs), *n.* لەشی ڕووەکی بێ گەڵاو ڕەگو قەد (وەك قەوزەو قارچك).

**than** (*th*an, *th*en; *unstressed th*ən, *th*'n), *conj.* (١) لە
*( John is taller ~ his brother.)*
(٢) لەوە؛ بە لاوە باشتر بوون: *( I would rather dance ~ eat.)* .
(٣) لە؛ لەوە زیاتر:
*( It was none other ~ Sam. He is no other ~ a thief.)*

**thanage** (thān′ij), *n.* (١) زەوی‌وزاری دەرەبەگێکی ئوسکوتلەندی کە نازناوەکەی " thane " ە . (٢) ماوەی بە دەستەوەبوونی ئەم زەوی‌وزارە. (٣) دەسەڵات‌و پلەوپایەی ئەم دەرەبەگە.

**thanato-** (than′ə-tō, than′ə-tə), پێشگرێکە بە مانای: مردن: *(thanatophobia)*

**thanatophobia** (than´ə-tə-fō′bi-ə), *n.* ترسی مردن.

**thanatopsis** (than´ə-top′sis), *n.* بیرکردنەوە لە مردن.

**thane** (thān), *n.* (١) نازناوێکی ئەنگلۆ ساکسۆنی کۆنی پیاوە دەرەبەگەکانە وەك : " خان " یا " بەگ " . (٢) نازناوێکی سکۆتلەندی کۆنی پیاوە دەرەبەگەکانە وەك: " خان " یا " بەگ " .

**thaneship** (thān′ship´), *n.* پلەوپایەو دەسەڵاتی " thane " . (ووشەی پێشوو ببینە).

**thank** (thaŋk), *v.t.* (١) سوپاس کردن
(٢) خەتاگرتن؛ لۆمە خستنە سەر؛ بە تەوسەوە سوپاس کردن:
*( He can be ~ed for our failure.)*
**have oneself to thank,** لۆمەی خۆ کردن؛ خەتای کەس نەگرتن هی خۆ نەبێ.

**thankful** (thaŋk′fəl), *adj.* سوپاسکەر؛ نمەکناسی؛ پێزان.

-thankfully *(adv.)*; thankfulness *(n.)*.

**thankless** (thaŋk′lis), *adj.* (١) بەد نمەك؛ نمەك نەناس؛ پێ نەزان. (٢) سوپاس ناکرێ؛ جێی سوپاس نی‌یە؛ ڕێزی لێ نانرێ (کاں): *( a ~ job, task, etc.)*

-thanklessly *(adv.)*; thanklessness *(n.)*.

**thanks** (thaŋks), *n.pl.* سوپاس؛ سوپاسنامە.
*interj.* سوپاس!؛ سوپاست دەکەم.
**thanks to,** (١) سوپاس بۆ. (٢) بە هۆی؛ بە سایەی؛ لە سایەی.

**thanksgiving** (thaŋks´giv′iŋ), *n.* (١) سوپاس کردن. (٢) سوپاسی خوا کردن. (٣) [T-]، جەژنی سوپاس کردنی خوا لە ئەمەریکا (ووشەی داهاتوو ببینە).

**Thanksgiving Day,** جەژنی سوپاس کردنی خوا لە ئەمەریکا (کە ڕێکەوتی چوارەم پێنج شەممەی مانگی یانزەی هەموو ساڵێك دەکات).

**thank-worthy** (thaŋk´wûr′*th*i), *adj.* شایانی سوپاسە؛ جێی سوپاسە.

**that** (*th*at; *unstressed th*ət), *pron.* (١) ئەوە:
*( I like this more than ~ .)*
(٢) کە (شت، کەس).
*( the house ~ we bought; the man ~ we saw)*
(٣) کە (شوێن): *( the place ~ I saw him)* .
(٤) کە (کات): *( the year ~ he was born)* .
(٥) شتێك؛ ئەو شتە:
*( There is ~ about him which mystifies me.)*
*adj.* (١) ئەو: *( T~ man is John. T~ apple tastes good.)* .
(٢) ئەوە: *( I can see this house more clearly than ~ one.)* .
*conj.* (١) کە؛ کە وا: *( The truth was ~ we never saw him.)* .
(٢) تاکوا بۆ ئەوەی؛ لەپێناوی: *( They died ~ we might live.)*
(٣) کە؛ کەوا: *( He ran so fast ~ I couldn't catch up.)*
(٤) کە؛ کەوا: *( I am sorry ~ I caused you so much grief.)*
(٥) خۆزگە: *( Oh, ~ this day were over.)* .
*adv.* ئەوەندە:
*( I can't see ~ far ahead. I am so tired ~ I could drop.)*
**at that,** [Colloq.], (١) هەر ئەوە؛ لەوێدا؛ لەو کاتەدا. (٢) لەگەڵ ئەوەشدا.
**in that,** چونکە؛ لەبەرئەوە.
**that's that!,** ئیتر بڕایەوە!؛ ئیتر تەواو؛ ئیتر مەسەلەکە بڕایەوە.
**that's to say,** واتا.

**thatch** (thach), *n.* (١) زەل‌و قامیش‌و پووش. (٢) سەربانی زەل‌و قامیش‌و پووش. (٣) قژ.
*v.t.* لە زەل‌و قامیش سەربان دروستکردن؛ سەری خانوو بە زەل‌و قامیش‌و پووش گرتن.

**thatching** (thach′iŋ), *n.* (١) سەری خانوو بە زەل‌و قامیش‌و پووش گرتن. (٢) زەل‌و قامیش‌و پووشی سەربان لێ دروستکراو.

**thaumatology** (thô´mə-tol′ə-ji), *n.* لێکۆڵینەوەی موعجیزە؛ نەریتی موعجیزە.

**thaumaturge** (thô′mə-tûrj´), *n.* موعجیزە دروستکەر؛ جادووگەر. (هەروەها " thaumaturgist " ).

**thaumaturgy** (thô′mə-tûr´ji), *n.* جادوو؛ موعجیزەکاری.

-thaumaturgic *(adj.)*; thaumaturgical *(adj.)*.

**thaw** (thô), *v.i.* (١) توانەوە (بەفر، سەهۆڵ).
(٢) بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی‌و توانەوەی شتی بەستوو:
*( It will ~ tomorrow.)*
(٣) گەرم‌وگوڕ بوون (پەیوەندی نێوان دوو کەس یا دوو وڵات... هتد).
*v.t.* تواندنەوە.
*n.* (١) توانەوە. (٢) ماوەیەك ئاووهەوای گەرم بۆ شت توانەوە.
(٣) گەرم‌وگوڕی (نێوان دوو کەس یا دوو وڵات... هتد)؛ ساردی نەمان
*( There is a ~ in the relations between the two countries.)*

**the** (*th*ə; *before vowels, th*i), *adj.*, definite article, ئامرازی ناساندن یا تایبەتی‌یە بەمانای " ەکە " و بەم جۆرانەی خوارەوە بەکاردەهێنرێ:

(١) لەگەڵ کەسێك یا شتێکی تایبەتی یا دیاریکراودا: *( ~ man; ~ house; ~ bank)*
(٢) لەگەڵ شتێکی تاقانەدا: *( ~ sun; ~ moon)* .
(٣) لەگەڵ ناوی تایبەتیدا: *( ~ Atlantic; ~ Alps; ~ Smiths)* .
(٤) لەگەڵ پلەی باڵادا (ڕێزمان): *( ~ largest; ~ most interesting)* .
(٥) لەگەڵ توخم یا چینێدا: *( T~ horse is an animal.)* .
(٦) لەگەڵ ئاوەڵناودا *( ~ dead, ~ dying and ~ wounded)* .
(٧) بۆ ناونووس کردنی کەسێك یا شتێك وەك دەست باڵاترین و بەناوبانگترینی چینەکەی یا توخمەکەی: *( Dr. X is ~ heart specialist.)* .

**the** (*th*ə), *adv.* چەند؛ ئەوەندە:
*( T~ sooner you start ~ sooner you will finish.)*

**theanthropic** (thē´an-throp′ik), *adj.* خوایی - ئادەمی

**theanthropism** (thi-an′thrə-piz'm), *n.* (١) (ا) تایبەخۆی ئادەمی دانە پاڵ خوا (ب) بڕوابوون بە بوونی بوونەوەری خوایی- ئادەمی. (٢) بڕوای ئاینی بە یەکگرتنی سرووشتی خوایی و ئادەمی لە عیسادا.
-theanthropist *(n.).*

**thearchy** (thē′är-ki), *n.* (١) theocracy .
(٢) چینی خوا بچکۆلەکان.

**theater, theatre** (thē′ə-tẽr), *n.* (١) شانۆ؛ سینەما؛ تەماشاخانە؛ تیاترۆ؛ شانۆخانە (٢) هۆڵی گوێگران.
(٣) مەیدان: جێی شت ڕوودان (بەتایبەتی جەنگ):
*( the Pacific ~ of war)*
(٤) (ا) شانۆگەریتی؛ هونەری شانۆگەری.
(ب) جیهانی شانۆگەری؛ شانۆگەران؛ ئەوانەی لە شانۆدا خەریکن.
(٥) شێوازی شانۆگەری سەرکەوتوو.

**theatergoer, theatregoer** (thē′ə-tẽr-gō´ẽr), *n.* کەسێکە کە زوو زوو دەچێتە شانۆ و سینەما.

**theater-in-the-round, theatre-in-the-round,** arena theater.

**theater of operations,** مەیدانی جەنگ

**theater of the absurd,** شانۆگەری بێ مانا: بزووتنەوەیەکی شانۆگەری سەدەی بیستەمە بێ مانایی ژیانی مرۆڤ دەردەخات لە جیهانێکی بێ مانادا

**theatrical** (thi-at′ri-k'l), *adj. Also* theatric, (١) شانۆیی: تایبەتی بە شانۆ و شانۆگەری (٢) خۆنوێنەرانە (لەڕووی سووکییەوە)؛ خۆدەرخەر بەشێوەیەکی منداڵانە و لە ڕادە بەدەر
-theatrically *(adv.).*

**theatricalism** (thi-at′ri-k'l-iz'm), *n.* خۆنواندن لە ڕادە بەدەر؛ زۆر خۆدەرخستن (لەڕووی سووکییەوە).

**theatricality** (thi-at´ri-kal′ə-ti), *n.* = theatricalism.

**theatricals** (thi-at′ri-k'lz), *n.pl.* شانۆگەری پێشکەش کراو لەلایەن ناپیشەوەرانەوە.

**theatrics** (thi-at′riks), *n.pl.* (١) هونەری نواندن لەسەر شانۆ؛ نواندن (٢) خۆنواندن بۆ سەرنج ڕاکێشان؛ زۆر خۆدەرخستن بەشێوەیەکی منداڵانە.

**thebaine** (thē′bə-ēn´, thi-bā′in), *n.* قلیەیەکی بێ ڕەنگی ژەهراوییە لە بەنگ دەردەهێنرێ و دەکرێ بە دەرمان.

**theca** (thē′kə), *n.* بەرگ (ڕووەکناسی)؛ بەرگ یا کیفی کرمۆکە
-thecal *(adj.).*

**thecate** (thē′kit), *adj.* کیفدار (گیانەوەرناسی، ڕووەکناسی)؛ بەرگدار.

**thé dansant** (tā´ dän´sän′), ئاهەنگی چا و سەمای پاش نیوەڕوان.

**thee** (*th*ē), *pron.* تۆ (شێوەی ئینگلیزی کۆن).

**theft** (theft), *n.* دزی؛ دزی کردن؛ دزین.

**thegn** (thān), *n.* = thane.

**theine** (thē′in, thē′ēn), *n. Also* thein, کافینی چا

**their** (*th*âr), *pron.* هی ئەوان؛ — یان: *( ~ house; ~ first defeat)* .

**theirs** (*th*ârz), *pron.* هی ئەوانە؛ هی ئەوان:
*( a friend of ~ ; That car is ~ . ; T~ are better.)*

**theism** (thē′iz'm), *n.* بڕوابوون بە خوا (بەتایبەتی بە یەك خوا)؛ خواناسی.

**theist** (thē′ist), *n. & adj.* خواناس؛ یەك خواناس؛ بڕوادار بە خوا.

**theistic** (thē-is′tik), *adj.* هی بڕوای تاقە خوایی؛ هی خواناسی.
-theistical *(adj.)*; theistically *(adv.).*

**them** (*th*em; *unstressed th*əm, *th*'m), *pron.* ئەوان؛ — ن:
*( We saw ~ . I told ~ .)*

**thematic** (thē-mat′ik), *adj.* (١) هی باس؛ هی سەرباس؛ هی ووتار. (٢) هی ڕیشەی ووتە (زمانەوانی).
-thematically *(adv.).*

**theme** (thēm), *n.* (١) باس؛ سەرباس؛ بابەت.
(٢) ووتار (بەتایبەتی کە قوتابی بۆ کۆرسێك دەینووسێ). (٣) ئاواز.
(٤) ڕیشەی ووشە (زمانەوانی).
(٥) ئاواز یا گۆرانی نیشانەی بەرنامەیەکی ڕادیۆ.

**theme song,** (١) ئاواز یا گۆرانی سەرەکی فیلمێك یا شانۆنامەیەك (کە چەندەها جار دووبارە دەکرێتەوە).
(٢) ئاواز یا گۆرانی نیشانەی بەرنامەیەکی ڕادیۆ.

**themselves** (*th*əm-selvz′), *pron.* خۆیان.

**then** (*th*en), *adv.* (١) ئەوسا؛ ئەو کاتە؛ لەو کاتەدا:
*( We were young ~ .)*
(٢) لە دوای ئەوە؛ پاشان؛ ئینجا؛ ئەوساکە:
*( He got up, took his hat, and ~ left.)*
(٣) دوای ئەوە؛ ئینجا:
*( First there is the bedroom to clean, ~ there is the kitchen.)*
(٤) کەوابوو؛ جا کەوابوو؛ کەواتە: *( Do it your way, ~ .)* .
(٥) هەروەها؛ لەسەر ئەوەیشەوە:
*( But I like to walk, and ~ it's cheaper.)*
(٦) ئیتر: *( From ~ onwards he behaved himself.)* .
*adj.* هی ئەوسا؛ هی ئەو کاتە؛ پێشوو: *( the ~ director)* .
*n.* ئەو کاتە؛ ئەوسا: *( By ~ , they were gone.)* .
 **but then,** بەڵام لە هەمان کاتیشدا؛ بەڵام.
 **now and then,** جاربەجار؛ جارنەجار؛ جارجار.
 **then and there,** یەکسەر؛ دەستبەجێ؛ کوتوپڕ.
 **what then?,** ئەی ئەوسا چی (ڕوو دەدات) ؟

**thenar** (thē′när), *n.* (١) بەری لەپ؛ لەپ؛ بەری پێ.
(٢) گۆشتی بن پەنجە گەورەی دەست.
*adj.* هی بەری لەپ؛ هی بەری پێ؛ هی گۆشتی بن پەنجە گەورەی دەست.

**thence** (*th*ens, thens), *adv.* (١) لەوێوە؛ لەو شوێنەوە.
(٢) لەو کاتەوە؛ لەو ساتەوە. (٣) لەبەرئەوە؛ بۆیە؛ کەوابوو.

**thenceforth** (*th*ens´fôrth′, thens′fōrth´), *adv.* لەو ساتەوە؛ لەو کاتەوە.

**thenceforward** (*th*ens´fôr′wẽrd, thens′fôr′wẽrd), *adv.* = thenceforth.

**thenceforwards** (*th*ens´fôr′wẽrdz, thens′fôr′wẽrdz), *adv.* = thenceforward.

**theo-, the-** (thē′ō, thē′ə), پێشگرێکە بەمانای: خوا:
*( theocracy)*

**theobromine** (thē´ə-brō′mēn), *n.* تیۆبرۆمین: ماددەیەکی تاڵی بلوورییە لە تۆو و گەڵای کاکاو دەردەهێنرێ بۆ دەرمان.

**theocentric** (thē´ə-sen′trik), *adj.* یەزدان بە بنچینە دانەر.

**theocracy** (thē-ok′rə-si), *n.* (١) (ا) ڕژێمی خوایی.
(ب) ڕژێمی قەشە و مەلا و مالووم؛ ڕژێمی ئاینی؛ ڕژێمێکە کە لەسەر ئاین

دامەزرابێت (٢) وولاّتێك كە ڕژێمی ئاینی بیبات بەڕێوە؛ وولاّتێك كە لەژێر دەستی قەشەو مەلاو مالووم دا بێ. (٣) دەستە پیاوی ئاینی دەسەلاّتدار.

**theocrat** (thē′ə-krat′), *n.* (١) سەرەك ڕژێمی ئاینی؛ سەرۆك ڕژێمی قەشەو مەلاو مالووم. (٢) پالّپشتیكەری ڕژێمی ئاینی.

**theocratic** (thē′ə-krat′ik), *adj.* هی ڕژێمی قەشەو مەلاو مالووم؛ هی ڕژێمی ئاینی.

**-theocratical** *(adj.)*; **theocratically** *(adv.)*.

**theodolite** (thē-od′ə-līt′), *n.* گۆشەپێوەر: ئامێرێكە زەوی پێو بەكاری دەهێنێ.

**theogony** (thē-og′ə-ni), *n.* بنەچەنامەی خواكان؛ ڕەگەزنامەی خواكان.

**-theogonic** *(adj.)*.

**theologian** (thē′ə-lō′jən, thē′ə-lō′ji-ən), *n.* ئاینزان؛ زانای ئاین.

**theological** (thē′ə-loj′i-k'l), *adj. Also* **theologic.** ئاینزانی؛ تایبەتی بە ئاینو زانستی ئاین.

**-theologically** *(adv.)*.

**theologize** (thē-ol′ə-jīz′), *v.t.* كردن بە بەشێك لە ئاینزانی.

*v.i.* بیركردنەوەو ڕەمڵ لێدان لەڕووی ئایناسییەوە.

**-theologizer** *(n.)*.

**theology** (thē-ol′ə-ji), *n.* ئاینزانی؛ ئایناسی؛ خواناسی.

**theomachy** (thē-om′ə-ki), *n.* (١) جەنگی دژ بە خواكان. (٢) جەنگی خوایی؛ جەنگی ناو خواكان.

**theomorphism** (thē′ə-môr′fiz'm), *n.* هاتنە بەرچاوو باسكردنی ئادەمیزاد وەك وێنەی خوا.

**-theomorphic** *(adj.)*.

**theopathy** (thē-op′ə-thi), *n.* هەستی ئاینی؛ كەشكەی ئاینی.

**theophany** (thē-of′ə-ni), *n.* دەركەوتنی خوا یا خوایەك بۆ ئادەمیزد.

**theophyline** (thē′ə-fil′ēn, thē′ə-fil′in), *n.* ماددەیەكی بێ ڕەنگی بلووری قلیەیییە لە گەلاّی چا دەردەهێنرێو دەكرێ بە دەرمان.

**theorbo** (thē-ôr′bō), *n.* ئامێرێكی مۆسیقی كۆنە لە عود دەچێ.

**theorem** (thē′ə-rəm), *n.* (١) بیردۆز؛ بیردۆزێكە كە پێویستی بە بەلگەیە (بیركاری). (٢) بیردۆزی بەلگە نەویست؛ بیری بە ڕاست دانراو.

**-theorematic** *(adj.)*.

**theoretical** (thē′ə-ret′i-k'l), *adj. Also* **theoretic,** بیردۆزی؛ ناكردەنی؛ هەر بەناو.

**-theoretically** *(adv.)*.

**theoretician** (thē′ə-rə-tish′ən), *n.* زانای بیردۆز (هی ڕشتەیەكی زانست یا هونەر)؛ بیردۆززان

**theoretics** (thē′ə-ret′iks), *n.pl.* بەشی بیردۆزی زانستێك

**theorist** (thē′ə-rist), *n.* (١) بیردۆزدانەر. (٢) بیردۆززان؛ زانای بیردۆزی زانستێك یا هونەرێك. (هەروەها " theoretician ").

**theorize** (thē′ə-rīz′), *v.i.* بیردۆز دانان؛ ڕەمڵ لێدان؛ وا دانان.

**theory** (thē′ə-ri), *n.* (١) بیر (٢) بۆچوونێك دەربارەی شێوەی كردنی شتێك. (٣) بیردۆز. (٤) بەشی بیردۆزی زانستێك. (٥) گریمانەكی؛ ڕەمڵ لێدان؛ وا دانان: *( My ~ is that he is lying.)* .

**theosophical** (thē′ə-sof′i-k'l), *adj. Also* **theosophic.** هی خواناسی؛ هی خواناسان.

**theosophist** (thē-os′ə-fist), *n.* خواناس.

**theosophy** (thē-os′ə-fi), *n.* (١) خواناسی (لە ڕێی بیركردنەوەو شت بۆ دەركەوتنەوە)؛ خواناسین. (٢) [T-]، بیروباوەڕو ڕێبازی بزووتنەوەیەكی تازەی ئەمەریكییە كە لەسەر بنچینەی ئاینی بوودیو براهمی دانراوە.

**therapeutic** (ther′ə-pū′tik), *adj. Also* **therapeutical,** -(١) چاككەرەوە (نەخۆشی بەبێ دەرمان)؛ چاككەر؛ چارەكەر. (٢) تایبەتی بە لقی پزیشكەوانی چاككەرەوە بەبێ دەرمان.

**therapeutics** (ther′ə-pū′tiks), *n.pl.* پزیشكەوانی چاك كردنەوە یا چارەكردن.

**therapist** (ther′ə-pist), *n.* پسپۆڕی چاك كردنەوە (نەخۆشی لەش یا دەروون بەبێ دەرمان)؛ پسپۆڕی دەروون.

**therapy** (ther′ə-pi), *n.* (١) نەخۆشیو لاوازی چارەكردن بەبێ دەرمان. (٢) توانای چارەكردن. (٣) psychotherapy .

**there** (*th*âr), *adv.* (١) لەوێ؛ لەویانە. (٢) بۆ ئەوێ؛ بەرەو ئەوێ: *( Go ~ .)* . (٣) ئەوسا؛ ئەو كاتە. (٤) لەوەدا؛ لەوێدا؛ لەو ڕووەوە: *( T~ you are wrong.)* . (٥) وا؛ وا ئێستا: *( T~ goes the whistle.)* . (٦) بەمانای پەسەندكردن یا ئافەرین كردن: *( T~'s a fine fellow!)* . (٧) بەمانای بوون: *( T~ is very little time. T~ are two girls here.)*

*n.* ئەوێ: *( We left ~ at six o'clock.)* .

*interj.* (١) بەمانای سەرسامی، بەربەرەكانی، یا ڕەزامەندی بەكاردەهێنرێ وەك: دەبڕۆ! هانێ!! ئەوەتا!! ئەوەتانێ!! ئەم ووت؟: *( T~ , that's done! T~ , now I can have some peace.)* (٢) بەمانای هاوسۆزی: *( T~ , ~ ! don't worry.)* .

**thereabout** (*th*âr′ə-bout′), *adv.* = **thereabouts.**

**thereabouts** (*th*âr′ə-bouts′), *adv.* (١) لە نزیك ئەوێوە؛ لەو نزیكانەدا؛ لەو دەوروپشتەدا. (٢) لە دەوروبەری ئەو كاتەدا؛ لە نزیك ئەو سەردەمەدا. (٣) نزیكەی ئەوەندە؛ نزیكەی (ژمارە، پلە، هەند) لەو دەوروبەرەدا.

**thereafter** (*th*âr-af′tēr, *th*âr-äf′tēr), *adv.* لەوەودوا؛ لە دوای ئەوە؛ لەو كاتە بە دواوە؛ لە پاش ئەوە.

**thereat** (*th*âr-at′), *adv.* (١) لەوێ؛ لەو شوێنە. (٢) ئەو كاتە؛ ئەوسا؛ لەو كاتەدا. (٣) لەبەرئەوە؛ بەهۆی ئەوەوە

**thereby** (*th*âr-bī′, *th*âr′bī′), *adv.* (١) بەوە؛ بەو هۆیەوە؛ بەو جۆرە؛ لە ئەنجامی ئەوەدا. (٢) لەو بارەیەوە؛ لەو ڕووەوە: *( T~ hangs a tale.)* . (٣) لە نزیك ئەو شوێنە؛ لەو نزیكەدا.

**therefor** (*th*âr-fôr′), *adv.* لەباتی ئەمە؛ بۆ ئەوە.

**therefore** (*th*âr′fôr′, *th*âr′fōr′), *adv. & conj.* كەوابوو؛ لەبەرئەوە؛ كەواتە؛ بەگوێرەی ئەمە.

**therefrom** (*th*âr-frum′, *th*âr-from′), *adv.* لەمەوە؛ لەوەوە.

**therein** (*th*âr-in′), *adv.* (١) لەوێدا؛ لەو شوێنەدا؛ لەو شتەدا. (٢) لەو مەسەلەیەدا؛ لەوەدا؛ لەوێدا (شت).

**thereinafter** (*th*âr′in-af′tēr, *th*âr′in-äf′tēr), *adv.* لە بەشی داهاتوودا (بەلّگەنامە، ووتار، پەڕتووك)؛ لە بەشی دوای ئەوەوە.

**thereinto** (*th*âr-in′too, *th*âr′in-too′), *adv.* (١) بۆ ناو ئەو شوێنە یا شتە. (٢) بۆ ناو ئەو مەسەلەیە یا بارودۆخە.

**theremin** (ther′ə-min), *n.* ئامێرێكی مۆسیقی ئەلەكترۆنییە.

**thereof** (*th*âr-uv′, *th*âr-ov′), *adv.* (١) دەربارەی ئەوە؛ دەربارەی ئەمە؛ لەو ڕووەوە. (٢) لەوەوە؛ لەو سەرچاوەیەوە؛ لەوێوە.

**thereon** (*th*âr-on′, *th*âr-ôn′), *adv.* (١) لەسەر ئەوە؛ لەسەر ئەو مەسەلەیە؛ دەربارەی ئەوە. (٢) یەكسەر دوای ئەوە؛ كوتوپڕ دوای ئەوە.

**there's** (*th*ârz), = **there is.**

**thereto** (*th*âr-too′), *adv.* (١) بۆ ئەوێ؛ بۆ ئەو شوێنە؛ بۆ ئەو شتە. (٢) [Archaic or Poetic]، لەسەر ئەوەیشەوە؛ زیاد لەوەیش؛ جگە لەوەش.

**theretofore** (*th*âr′tə-fôr′, *th*âr′tə-fōr′), *adv.* تا ئەو كاتە؛ هەتا ئەوسا؛ لەپێش ئەوەدا.

**tide over,** (١) بارمەنیدان لە تەنگانەدا هەتا دەبووژێتەوە:
***( The loan will tide us over till the next paycheck.)***
(٢) بەرگەگرتن: دەربردن؛ سەرکەوتن؛ زاڵبوون.
**turn the tide,** بارودۆخ وەرگەڕاندن: بارودۆخ گۆڕین بەتەواوی.
**tide** (tīd), *v.i.* [Archaic]. ڕوودان
**tideland** (tīd′land′), *n.* زەوی ژێرئاوکەوتوو لەکاتی بەرزاودا.
**tidemark** (tīd′märk′), *n.* نیشانەی بەرزاو و نیشتاو. ئەو ئاستەی کە ئاو دەیگاتێ لەکاتی بەرزاو و نیشتاودا.
**tiderip** (tīd′rip′), *n.* گێژاوێکە لە بەیەک گەیشتنی دوو تەوژمی ئاو یا بەرزاو پێکدێت
**tidewaiter** (tīd′wāt′ēr), *n.* پشکنەرێکی گومرگە چاودێری بارداگرتنی کەشتی دەکات
**tidewater** (tīd′wô′tēr, tīd′wä′tēr), *n.* (١) ئاوی بەرزاو (کە کەناردەریا دادەپۆشێ). (٢) ئاوی ئەو جۆگانەی کە بەپێی بەرزاو و نیشتاو ئاوەکەیان بەرزو نزم دەبێتەوە. (٣) کەناردەریای نزم.
**tideway** (tīd′wā′), *n.* ئاوەڕوی بەرزاو
**tidings** (tī′diŋz), *n.pl.* دەنگوباس؛ هەواڵ
***( ~ of great joy)***
**tidy** (tī′di), *adj.* (١) ڕێکوپێک (مرۆڤ، شوێن)؛ پاکوتەمیز؛ خاوێن.
(٢) [Colloq.]، باش؛ چاک؛ پەسەند.
(٣) [Colloq.]، زۆر؛ ئێجگار زۆر: ***( a ~ sum of money)*** .
***v.t. & v.i.*** ڕێکوپێک کردن؛ پاک کردنەوە؛ ڕێکخستن:
***( T~ up your room.)***
***n.*** بەرگی نەخشداری سەر قۆڵ و پشتی کورسی و قەنەفە.
**-tidily** *(adv.)*; **tidiness** *(n.)*.
**tidytips** (tī′di-tips′), *n.* ڕووەکێکە گوڵی وەک گوڵە چاوپشیلە دەگرێ.
**tie** (tī), *v.t.* (١) بەستن؛ پێکەوەبەستن؛ توندکردنەوەو بەستن
(٢) گرێدان؛ گرێ لێدان. (٣) لێکدان؛ یەک پێگرتن.
(٤) بەستنەوە؛ ڕستکردن؛ پێوەندکردن. (٥) هاوتابوون (یاری، پێشبڕکێ).
(٦) [Colloq.]، مارەکردن؛ جووت کردن.
(٧) لێکدانی دوو ئاوازی مۆسیقا بە هێڵێکی باریک.
***v.i.*** (١) گرێدران؛ گرێ لێ دران؛ بۆ گرێدان شیان.
(٢) هاوتابوون (یاری، پێشبڕکێ): ***( The two teams ~d.)*** .
***n.*** (١) پەت؛ قەیتان؛ بەن
(٢) پەیوەندی؛ پەیوەستی: ***( a business ~ ; ~s of affection)*** .
(٣) بۆینباخ. (٤) دەستەک؛ داری ڕایەڵ کراو (بۆ لێکدان و چەسپاندنی دوولای چوارچێوەیەک یا خانوویەک). (٥) داری ژێر هێڵی شەمەندەفەر (لەژێر هەردوو هێڵەکەدا ڕایەڵ دەکرێ و پێکەوە دەیانبەستێ) (هەروەها " sleeper "، " railroad tie "). (٦) هاوتایی (یاری، پێشبڕکێ، هەڵبژاردن).
(٧) پێشبڕکێ یا بۆربۆڕێنێکە کە ئەنجامەکەی هاوتایی بێ و هیچ لایەک نەیبانەوە: هاوتایی (یاری، پێشبڕکێ).
(٨) هێڵی سەر یا ژێر دوو ئاوازی مۆسیقا.
**tie down,** بەستنەوە؛ قەتیس کردن؛ ڕێی هاتوچۆ لێ برین.
**tie one on,** [Slang]. مەست بوون؛ سەرخۆش بوون؛ پێک خواردنەوە
**tie up,** (١) پێوەندکردن؛ بەستنەوە. (٢) پێچانەوەو بەستن؛ بەستن.
(٣) لەنگەرخستن. (٤) وەستاندن؛ ڕێ لێگرتن؛ کۆسپ خستنە بەردەم.
(٥) دەست گیران؛ خەریک کردن.
**tieback** (tī′bak′), *n.* پەردەبەند: پەتێکە ئارقەدی پەردەی پێ دەبەسترێت، کە لادەبرێت و دەخرێتە لایەکی پەنجەرەکەوە.
**tie beam,** دەستەک؛ نیرگە
**tie-in** (tī′in′), *n.* (١) پەیوەندی؛ پەیوەستی.
(٢) (ا) فرۆشتنی دوو شت پێکەوە.
(ب) یەکێک لەم دوو شتە (بەتایبەتی شتە کەم بایەخ و کەم ڕەواجەکەیان).
**tiepin** (tī′pin′), *n.* دەرزی بۆینباخ
**tier** (têr), *n.* ڕیزە کورسی؛ تەلان؛ تیرە؛ چین.
***v.t. & v.i.*** ڕیزکردن؛ بە ڕیز ڕیز ڕێکخستن؛ چین چین کردن؛ کردن بە تەلان.
**tier** (tī′ēr), *n.* (١) بەستەرەوە (مرۆڤ، شت).
(٢) بەرگێکی منداڵانە لە بەروانکە دەچێ.
**tierce** (têrs), *n.* (١) سێ‌یەک.
(٢) پێوانەیەکی کۆنە بریتی‌یە لە (٤٢) گالۆن.
(٣) پیپێکە کە ئەوەندە بگرێ. (٤) پێڕی سێ کاغەزیی یەک لە دوای یەک.
**tiff** (tif), *n.* (١) هەڵچوونێکی کەم خایەن؛ تووڕەیی.
(٢) شەڕێکی بچووک؛ دەمەقاڵێ؛ دەمەقرێ: ***( We had a ~ .)*** .
***v.i.*** شەڕبوون؛ شەڕێکی بچووک کردن؛ دەمەقاڵێ بوون.
**tiffany** (tif′ə-ni), *n.* مۆزلین: قوماشی ئاوریشم یا مۆزلینی تەنک
**tiffin** (tif′in), *n.* [British]. قاوەڵتی؛ نانی نیوەڕۆ.
***v.t. & v.i.*** نانی نیوەڕۆ خواردن؛ قاوەڵتی کردن.
**tiger** (tī′gēr), *n.* (١) پڵنگ؛ بەور. (٢) گیاندارێک لە توخمی پڵنگ.
(٣) کەسێکی دڕ یا چاونەترس؛ کەسێکی خوێنخۆر
**-tigerish** *(adj.)*.
**tiger bettle,** قالۆنچەی پڵنگی: قالۆنچەیەکە جانەوەری تر دەخوات.
**tiger cat,** پشیلە پڵنگ؛ پشیلە کێوی‌یەکی بەڵەکە.
**tigereye** (tī′gēr-ī′), *n.* *Also* **tiger's eye,** بەردێکی نیمچە بەنرخی زەرد–قاوەیی‌یە خشڵی لێ درووست دەکرێ.
**tiger lily,** گوڵە بەور: ڕووەکێکە گوڵی پرتەقاڵی پنکە پنکە دەگرێت.
**tiger moth,** مۆرانەی پڵنگی: مۆرانەیەکی زل باڵ پنکە پنکەیی‌یە.
**tight** (tīt), *adj.* (١) چڕ. (٢) کونبڕ؛ هەوابڕ؛ ئاوبڕ.
(٣) توند؛ تونگ؛ قایم؛ چەسپیو؛ چەسپ.
(٤) جەڕاو؛ شەتەک دراو؛ جەڕێنراو.
(٥) کرژ؛ گرژ: ***( a ~ smile)*** .
(٦) تەنگ؛ تەسک؛ تەنگەبەر.
(٧) سفت؛ سفتوسۆڵ. ***( a ~ weave)*** .
(٨) تەسکوترووسک؛ تەسک؛ پڕ بەبەر: ***( a ~ fit)*** .
(٩) توند؛ گیراو: ***( a ~ feeling in the chest)*** .
(١٠) توندوتیژ؛ بەزەبر: ***( She kept ~ control over her children.)*** .
(١١) (ا) کەم؛ دەست ناکەوێ؛ کز: ***( ~ money)*** .
(ب) شتی تێدا دەست ناکەوێ: ***( a ~ market)*** .
(١٢) تەنگوچەڵەماوی؛ سەخت؛ ناهەموار؛ گران؛ دژوار؛ ئاڵۆز:
***( a ~ situation, spot, etc.)***
(١٣) نزیک (پێشبڕکێ)؛ هاوتا؛ سەخت: ***( a ~ race, contest, match)*** .
(١٤) کورت و پڕ مانا؛ کورت
(١٥) [Archaic or Dial.]، جوان و ڕێکوپێک (باڵا)؛ خنجیلانە.
(١٦) [Dial.]. کارامە؛ کارزان.
(١٧) [Colloq.]، پیسکە؛ پارە پیس؛ گیر؛ ڕەزیل.
(١٨) [Slang]، مەست؛ سەرخۆش.
***adv.*** (١) توند؛ قایم؛ چەسپیو: ***( Shut the window ~ .)*** .
(٢) قووڵ، قورس، خۆش؛ یا شیرین (خەو): ***( Sleep ~ .)*** .
**-tightly** *(adv.)*; **tightness** *(n.)*.
**sit tight,** جووڵە نەکردن؛ چاوەڕێ کردن (تا بارودۆخ دەگۆڕێ)؛ چارێ هیچ نەکردن
**tighten** (tīt′'n), *v.t.* (١) (ا) جەڕاندن؛ شەتەک دان؛ قایم کردن؛ توندکردنەوە. (ب) هێنانەوەیەک (ماسولکە)؛ کرژکردن؛ گرژکردن
(٢) تەسک کردنەوە.
***v.i.*** (١) (ا) هاتنەوەیەک؛ کرژبوون. (ب) جەڕان؛ قایم بوون؛ توندبوونەوە.
(٢) تەسک بوونەوە.
**tightfisted** (tīt′fis′tid), *adj.* گیر؛ پوولەکی؛ ڕەزیل.
**tight-lipped** (tīt′lipt′), *adj.* (١) لچ هەڵقورچاو؛ دەم داخراو.
(٢) دەم دووراو؛ نەدوو؛ دەم نووقاو.
**tightrope** (tīt′rōp′), *n.* تەناف (تەنافبازی)
**tights** (tīts), *n.pl.* جلی تەسکی کشاوی تەنافبازو سەماکەر.

**tightwad** (tīt′wäd′, tit′wôd′), *n.* [Slang], کەسێکی پووڵەکی یا ڕەزیل

**tiglon** (tī′glon), *n. Also* tigon, شێرپڵنگ. بەچکەی پڵنگ و دەلەشێر

**tigress** (tī′gris), *n.* (١) مێ پڵنگ (٢) ئافرەتی دڕ.

**tike** (tīk), *n.* = tyke.

**til** (til, tēl), *n.* کونجی

**tilbury** (til′bĕr-i), *n.* گالیسکەیەکی سووکی دووپێچکەی دووکەسییە.

**tilde** (til′də), *n.* تیلدە. هێڵێکی بچووکە وەك ئەمە ( ~ ) دەخرێتە سەر پیتی " n " لە ئیسپانیداو نیشانەی ئەوەیە کە وەك " ny " دەخوێنرێتەوە وەك لە وشەی " señor " دا.

**tile** (tīl), *n.* (١) خشتی کاشی؛ کاشی؛ خشتی ئاومال.
(٢) [Colloq.] تەپلەی دریژو ڕەق.

***v.t.*** به خشتی کاشی داپۆشین؛ کاشی پۆش کردن. *( to ~ a bathroom)*

**-tiler** *(n.).*

**tilefish** (tīl′fish′), *n.* ماسییەکی گەورەی پنکە پنکەیی پۆپنەدارە

**tilery** (tīl′ēr-i), *n.* کارگەی خشتی کاشی.

**tiling** (tīl′iŋ), *n.* (١) کاشی پۆش کردن؛ کاشی دانان؛ کاشیکاری.
(٢) کاشی؛ خشتی کاشی (٣) ڕووی کاشی کراو؛ ڕووی بە کاشی داپۆشراو.

**till** (til), *prep.* (١) هەتا؛ تا؛ هەتاکو.
(٢) [Obs. or Scot.] هەتا (شوێن). (٣) [Scot.] بۆ؛ دەربارەی.

***conj.*** هەتا؛ تاکو.

**till** (til), ***v.t. & v.i.*** کێڵان و چاندن؛ کشت کردن؛ زەوی خۆش کردن.

**till** (til), *n.* (١) چەکمەجی پارە (لە فرۆشگایەکدا). (٢) پارەی بەردەست.

**till** (til), *n.* قوڕو ئەو زیخ و بەردی تێکەڵاو (بەتایبەتی هی پاشماوەی ڕووباری سەهۆڵین).

**tillage** (til′ij), *n.* (١) کشتیاری؛ کشتکاری
(٢) زەوی خۆش کراو؛ زەوی کێڵراوو چێنراو (٣) بەرهەمی کشتوکاڵی.

**tillandsia** (ti-land′zi-ə), *n.* ڕووەکێکی قەد باریکی گەڵا ووردە بە دارو درەختدا شۆڕ دەبێتەوە لە لای خوارووی ئەمەریکا.

**tiller** (til′ēr), *n.* دەسکی ستێرن یا سوکانی کەشتی و بەلەم.

**tiller** (til′ēr), *n.* جووتیار؛ کشتیار؛ کشتکار؛ وەرزێر.

**tiller** (til′ēr), *n.* خەلفی لە ڕەگەوە یا بنی قەدەوە دەرهاتوو؛ وەچ.

***v.i.*** وەچ دەرکردن؛ خەلف دەرکردن.

**tilt** (tilt), ***v.t.*** (١) لارکردنەوە؛ خوارکردنەوە
(٢) ڕمبازی کردن؛ ڕم تێگرتن (بە سواری ئەسپەوە).
(٣) هێرش بردنە سەر. (٤) دارشتن (کانزا).

***v.i.*** (١) لاربوونەوە؛ خواربوونەوە. (٢) ڕمبازی کردن (٣) هێرش بردنە سەر.
(٤) ملەملێ کردن؛ پێشبڕکێ کردن (٥) مشتومڕکردن.

***n.*** (١) ڕمبازی (٢) مشتومڕی گەرم (٣) لاربوونەوە؛ خواربوونەوە؛ لاری.
(٤) لێژگە؛ لێژایی؛ لێژی. (٥) seesaw (٦) tilt hammer.

**at full tilt,** بەوپەڕی خێراییەوە؛ زۆر بەخێرایی؛ بە هەموو هێزێکەوە؛ زۆر بە هێزەوە

**tilt at windmills,** شەڕ لەگەڵ دوژمنی درۆ یا خەیاڵیدا کردن؛ کاری بێ سوود کردن؛ شتی کەرانە کردن.

**tilt** (tilt), *n.* چەتر یا سەری بەلەم و گالیسکە.

***v.t.*** سەر گرتن؛ سەر داپۆشین؛ پۆشین.

**tilth** (tilth), *n.* (١) کێڵان و چاندن؛ زەوی کێڵان و خۆش کردن
(٢) زەوی کێڵراو و چێنراو؛ زەوی خۆش کراو.

**tilt hammer,** چەکوشی کانزا کوتان و دارشتن؛ ئامێری دارشتن و نیشانەکردن

**tiltyard** (tilt′yärd′), *n.* مەیدانی ڕمبازی

**timbal** (tim′b'l), *n. Also* tymbal, = kettledrum.

**timbale** (tim′b'l), *n.* خواردنێکە لە مریشك و ماسی و کوڵەی ئاو دەکرێ و لە فرندا لێ دەنرێ وەك قاڵب.

**timber** (tim′bēr), *n.* (١) (ا) خانوو (ب) کەرەسەی خانوو؛ داروپەردوو
(٢) دارو تەختە (خانووسازی؛ دارتاشی، کەشتی دروستکردن).
(٣) تیرگە. (٤) دارو درەخت. (٥) دارستان.
(٦) ماك؛ ئەبەردی؛ چۆنێتی ڕەفتار. (٧) تیغە (کەشتی دروستکردن)

***v.t.*** بە دارو تەختە داپۆشین یا دروستکردن؛ دار دانەبەر.

***adj.*** هی دارو تەختە؛ بۆ دارو تەختە.

***interj.*** هاوارێکی ووریاکردنەوەی دارکەرە کە ئەو دارەی دەیبڕێتەوە خەریکە بکەوێ.

**timbered** (tim′bērd), *adj.* (١) دارین؛ بە دارو تەختە کراو یا داپۆشراو. (٢) دارودرەختاوی؛ دارودرەخت داپۆشیو.

**timbering** (tim′bēr-iŋ), *n.* (١) دارو تەختە.
(٢) شتی دارین؛ شتی لە دارو تەختە دروستکراو.

**timberland** (tim′bēr-land′), *n.* دارستان.

**timber-line** (tim′bēr-līn′), *n. Also* **timber line,** ئەو هێڵە یا ئاستەیە کە ئیتر لەوە بەولاوە دارو درەخت ناڕوێ لەسەر شاخە بەرزەکان و هەرێمی تەوەرەکان.

**timber wolf,** گورگی دارستان؛ گورگێکی گەورەی ئەمەریکای باکوورە.

**timberwork** (tim′bēr-wūrk′), *n.* شتی دارین (خانوو، بەلەم)؛ شتی لە دارو تەختە دروستکراو.

**timbre** (tim′bēr, tam′bēr), *n.* (١) چۆنێتی دەنگ (کە دەنگێك لە دەنگێکی تر جیادەکاتەوە جگەلە بەرزی و نزمی و توندوتیژی)
(٢) ڕادەی دەنگدانەوەی تیپی دەنگدار بەتایبەتی تیپە بزوێن (دەنگناسی)

**timbrel** (tim′brəl), *n.* = tambourine.

**time** (tīm), *n.* (١) کات.
(٢) (pl.)، چەرخ؛ سەدە: *( medieval ~s)* .
(٣) سەردەم: *( in Lincoln's ~ )* .
(٤) (pl.)، ڕۆژگار؛ ڕۆژ: *( T~s are bad.)* .
(٥) ماوە: *( a ~ of sorrow)* .
(٦) کات؛ کاتێکی تایبەتی: *( I had a good ~ .)* .
(٧) (ا) ماوەی ژیان؛ ژیان: *( My ~ is almost over.)* .
(ب) کات یا ماوەی سکپڕی. (ج) ماوەی شاگردی.
(د) ماوەی بەندی؛ ماوەی زیندانی.
(٨) کاتی پێویست بۆ کردنی شتێك؛ کاتی بەدەستەوە بوو:
*( I don't have ~ for reading.)*
(٩) ماوەی پێچوونی کارێك یا شتێك.
(١٠) (ا) ماوەی ئیشکردنی کرێکار یا مووچەخۆر.
(ب) کرێ یا مووچەی ئەم ماوەیە.
(١١) خێرایی (ڕۆیشتن، ئوتومبیل لێخوڕین، کارکردن... هتد):
*( to go at double ~ )*
(١٢) ماوەی پێچوون (بەسەرهاتی شانۆگەری).
(١٣) (ا) خێرایی ئاوازی مۆسیقا. (ب) ماوەی ئاوازێك.
(١٤) سات؛ ساتی کاتژمێر: *( what ~ is it ?)* .
(١٥) کاتی ڕوودانی شتێك: *( The ~ of the accident was 5:30 .)* .
(١٦) (ا) سەرەمەرگ؛ کاتی مردن.
(ب) کاتی منداڵبوون؛ ساتی منداڵبوون: *( She is near her ~ .)* .
(ج) کاتی خۆیەتی؛ کاتی گونجاو یا باشترین کات بۆ کردنی شتێك؛ هەرەت:
*( Now is the ~ to act.)*
(١٧) کەرەت؛ جار؛ ژەم (کات)؛ کایە؛ گا:
*( I've told him three ~s . ~ and ~ again)*
(١٨) شێوەی کات ڕاگرتن: *( solar ~ ; standard ~ )* .

***interj.*** نیشانەی دوایی هاتنی کایەی یاری یا یاری وەستاندن.

***v.t.*** (١) کات دیاریکردن؛ کات بۆ دانان.
(٢) گونجاندن؛ ڕێکخستن لەڕووی کاتەوە. (٣) هاوکات کردن.

***adj.*** (١) تایبەتی بە کات؛ کاتی.
(٢) کات بۆ دانراو؛ وا نراوەتەوە کە لە کاتێکی دیاریکراودا بتەقێتەوە:
*( a ~ bomb)*

(٣) له ڕۆژێکی دیاریکراودا دەدرێتەوە: ***( a ~ loan)*** .
(٤) کراوە بە قیست: مانگ بە مانگ دەدرێتەوە: ***( a ~ payment)*** .
**ahead of time,** زوو؛ لەپێش کاتی خۆیدا.
**at one time,** (١) لە هەمان کاتدا؛ پێکەوە. (٢) جاران؛ جاری جاران.
**at the same time,** (١) لە هەمان کاتدا؛ پێکەوە. (٢) لەگەڵ ئەوەشدا.
**at times,** جاروبار؛ هەندێ جار؛ ناوبەناو.
**behind the times,** دواکەوتوو؛ باو نەماو؛ کۆن.
**behind time,** درەنگ؛ لەدوا؛ دواکەوتوو.
**between times,** جارنەجار؛ جاربەجار؛ ناوبەناو.
**do time,** [Colloq.], لە بەندیخانەدا بوون؛ کات بردنە سەر لە بەندیخانەدا.
**for the time being,** بۆ ئەم کات یا سەردەمەی ئێستا؛ بۆ ئێستا؛ جارێ.
**for time to time,** جاربەجار؛ جارنەجار؛ ناوبەناو.
**gain time,** (١) درێژەپێدان یا بە قنگدا خستن تا کاتێکی باشتر دێتە پێش.
(٢) خێرا (کاتژمێر)؛ لەپێش.
**in good time,** (١) لە کاتی خۆیدا؛ لە کاتێکی باشدا. (٢) خێرا؛ زوو.
**in no time,** زۆر خێرا؛ زۆری پێ ناچێ؛ یەکسەر؛ بەخێرایی.
**in the meantime,** لە هەمان کاتدا.
**in time,** (١) لە کاتی دیاریکراودا. (٢) زوو بێ یا درەنگ
**lose time,** (١) هێواش (کاتژمێر)؛ لەدوا.
(٢) کات لەکیس چوون؛ کات لەدەست چوون.
**make time,** (١) خێراتر ڕۆیشتن بۆ بەدەست کەوتنەوەی کاتی لەکیس چوو (شەمەندەفەر... هتد). (٢) باش یا خێرا ڕۆیشتن یا ئیشکردن:
***( We made good time between NewYork and Washington.)***
**many a time,** گەلێک جار؛ چەندەها جار.
**on one's own time,** لە کاتی خۆدا نەک هی کۆمپانیا؛ لە کاتی ئەو کەسە خۆیدا کە کرێ وەرناگرێ نەک لە کاتی ئیشکردندا.
**on time,** (١) لە کاتی دیاریکراودا؛ بەبێ دواکەوتن؛ بەبێ دواخستن.
(٢) بە قیست ***( to buy things on time)*** .
**out of time,** لە ناکاتدایە؛ کاتی خۆی نییە.
**time after time,** جار لە دوای جار؛ گەلێک جار؛ پەیتاپەیتا.
**time and again,** = **time after time.**
**time of life,** تەمەن
**time of one's life,** [Colloq.], کاتێکی زۆر خۆش

**time and a half,** کرێی ئەوەندەو نیو (بۆ ئەو کاتانەی کە کرێکار ئیش دەکات لەسەروو کاتی کارکردنی ئاسایییەوە).
**time bomb,** بۆمبای کات بۆ دانراو بۆ تەقینەوە: بۆمبایەکە دەنرێتەوە بۆ تەقینەوە لە کاتێکی تایبەتیدا.
**time capsule,** کەپسوولەی ڕۆژگار: دەفرێکە کەلەپووری کلتووریو زانستیو هونەری چەرخێکی تێدا هەڵدەگیرێو دادەخرێ هەتا ئەوەی دواڕۆژ دەیکەنەوە
**time-card** (tīm′kärd′), *n.* کارتی کات ڕاگرتن: کارتێکە کاتی دەست بە ئیشکردنو دەست لە ئیش هەڵگرتنی ڕۆژانەی کرێکاری تێدا تۆمار دەکرێ.
**time clock,** کاتژمێری کات ڕاگرتن: کاتژمێرێکە کاتی دەست بە ئیشکردنو دەست لە ئیش هەڵگرتنی کرێکار تۆمار دەکات لەسەر کارتێک.
**time deposit,** پارەیەکە دەخرێتە بانقەوەو دەرناهێنرێتەوە تا کاتێکی دیاریکراو
**time exposure,** (١) فیلمی فۆتۆگرافی دانەبەر تیشکی ڕووناکی.
(٢) وێنەی بەم جۆرە گیراو.
**time-honored** (tīm′on′ẽrd), *adj.* ڕێز لێ گیراو لەبەر کۆنی:
***( ~ customs)***
**time immemorial,** کاتی زۆر کۆن؛ دێرین
**timekeeper** (tīm′kēp′ẽr), *n.* (١) کاتژمێر
(٢) (أ) کات ڕاگری کارگە: کەسێکە ساتی ئیشکردنی کرێکاری کارگەیەک دەنووسێو دەژمێرێ. (ب) کات ڕاگری یاری.
**timeless** (tīm′lis), *adj.* (١) هەتاهەتایی؛ هەتاهەتا؛ نەمر؛ بێ پایان.
(٢) بە کاتەوە نەبەستراوە؛ هەمیشە ڕاستە؛ هەرگیز ناگۆڕێ.
(٣) [Obs.]، **untimely** .
-timelessness *(n.)*.
**time limit,** کاتی دیاریکراو: کاتێکی دیاریکراوە کە دەبێ ئیشێکی تێدا تەواو بکرێ.
**time loan,** قەرزێکە کە دەبێ لە کاتێکی دیاریکراودا بدرێتەوە.
**time lock,** قفڵێکە کە لە پێش کاتێکی دیاریکراودا ناکرێتەوە.
**timely** (tīm′li), *adj.* (١) لە کاتی خۆیدا؛ لە کاتێکی باشدا:
***( He gave me some ~ advice.)***
(٢) [Obs. or Rare]، زوو؛ پێش کاتی خۆی
*adv.* (١) لە کاتی خۆیدا. (٢) [Archaic]، زوو.
-timeliness *(n.)*.
**timeous** (tīm′əs), *adj.* [Scot.], = **timely.**
**time-out** (tīm′out′), *n. Also* **time out,** (١) پشوو؛ مۆڵەت؛ ووچان؛ ئیش وەستان. (٢) پشوو (یاری)؛ یاری وەستان بۆ ماوەیەکی کورت لەسەر داواکردنی یەکێک لە تیپەکان.
**timepiece** (tīm′pēs′), *n.* کاتژمێر.
**timer** (tīm′ẽr), *n.* (١) **timekeeper** .
(٢) کاتژمێر (بەتایبەتی هی پێشبڕکێ کە دەتوانرێ بوەستێنرێو بخرێتەوە ئیش بۆ کات ڕاگرتن). (٣) کات ڕاگری مەکینە (کە دەبێتە هۆی پریشکدانەوەی پلاکەکان لە کاتی خۆیدا)
**times** (tīmz), *prep.* ئەوەندە جار (لێکدان- بیرکاری):
***( Five ~ two is ten.)***
**timesaving** (tīm′sāv′iŋ), *adj.* کات بۆ گەڕێنەرەوە:
***( a ~ method)***
-timesaver *(n.)*.
**timeserver** (tīm′sũr′vẽr), *n.* هەل پەرست؛ کەسێکی هەل پەرست.
**timeserving** (tīm′sũr′viŋ), *n.* هەل پەرستی.
*adj.* هی هەل پەرست؛ هەل پەرست.
**timetable** (tīm′tā′b'l), *n.* خشتەی کات (بەتایبەتی هی ڕۆیشتنو گەیشتنی شەمەندەفەرو پاسو فڕۆکەو کەشتی)؛ خشتەی کاتی ڕوودانی شتێک یا کردنی کارێک.
**time-tested** (tīm′tes′tid), *adj.* تاقیکراوە؛ دەرچوو؛ لە تاقیکردنەوەی ڕۆژگاردا دەرچووە: ***( ~ methods)*** .
**timework** (tīm′wũrk′), *n.* ئیشوکارێکە بەپێی کات کرێکەی دەدرێ نەک بە قۆنتەرات یا بەپێی ئیش. (ووشەی " **piecework** " ببینە).
-timeworker *(n.)*.
**timeworn** (tīm′wôrn′), *adj.* سواو؛ کۆن؛ پەڕیووت.
**time zone,** ناوچەی جوگرافی هاوسات؛ هاوکات:
***( There are four ~s in the United States.)***
**timid** (tim′id), *adj.* ترسنۆک؛ شەرمن؛ بڕوا بە خۆ نەبوو؛ بێ زات.
-timidly *(adv.)*; **timidness** *(n.)*.
**timidity** (ti-mid′ə-ti), *n.* ترسنۆکی؛ شەرمنی؛ بێ زاتی؛ بڕوا بە خۆ نەبوون.
**timing** (tīm′iŋ), *n.* (١) کات دانان (بۆ باشترین ئەنجام)؛ کاتی ڕوودان؛ کاتی تایبەتی هەڵبژاردن بۆ کردنی شتێک:
***( The ~ of the visit was very good.)***
(٢) کات ڕاگرتن (بە کاتژمێری کات ڕاگر لە پێشبڕکێدا).
**timocracy** (tī-mok′rə-si), *n.* (١) ڕژێمێکە کە لەسەر بنچینەی شەرەفو سەربەرزی دانرابێ (ئەفلاتون). (٢) ڕژێمێکە کە لەسەر بنچینەی سامانو خاوەن زەوییوزاری دانرابێ (ئەرستۆ).
-timocratic *(adj.)*.
**timorous** (tim′ẽr-əs), *adj.* ترسنۆک؛ بێ زات.
-timorously *(adv.)*; **timorousness** *(n.)*.
**timothy** (tim′ə-thi), *n.* گیایەکی گەڵا باریکو درێژە گوڵێکی

دریژکۆله دەگرێ بەسەری لاسکێکی دریژەوە (بۆ ئالف بەکاردێت).
**timpani** (tim′pə-ni), *n.pl. Also* tympani, چەند تەبلێکی دەنگ جیان یەك تەسۆدن نیشان دەدات
**-timpanist** *(n.).*
**tin** (tin), *n.* (١) تەنەکە: کانزا (٢) پەرەی تەنەکە (٣) تەنەکە (دەفر).
(٤) [British]: قوتو؛ قوتوی خواردەمەنی
(٥) [Obs. Slang]: پارە؛ دراو
*v.t.* (١) بە تەنەکە ڕووکەش کردن.
(٢) [British]: کردنە قوتووەوە (خواردەمەنی)
**tinamou** (tin′ə-moo′), *n.* باڵندەیەکی ئەمریکای ناوەڕاست و باشوورە لە تۆخمی پورە
**tincal** (tiŋ′kəl, tiŋ′käl, tiŋ′kôl), *n.* بۆرەکی خاو (کیمیا)
**tinct** (tiŋkt), *adj.* [Poetic]. ڕەنگ کراو
*n.* [Poetic]. ڕەنگ: بۆیە
*v.t.* [Obs.]. ڕەنگ کردن
**tinctorial** (tiŋk-tôr′i-əl, tiŋk-to′ri-əl), *adj.* تایبەتی بە ڕەنگ؛ تایبەتی بە ڕەنگ کردن یا بۆیەکردن.
**tincture** (tiŋk′chēr), *n.* (١) بۆیە (٢) ڕەنگ: ڕەنگی کاڵ
(٣) نیشانە: تامێکی کەم؛ تایبەخۆ (٤) کانزا یا ڕەنگی قەڵفانی سوارچاك.
*v.t.* (١) ڕەنگ کردن؛ نەختێك بۆیە لێدان. (٢) نەختێك کارتێکردن
(٣) پێدان (تام، بۆن)؛ نەختێك تێکردن.
**tinder** (tin′dēr), *n.* پوشوو: قاو
**tinderbox** (tin′dēr-boks′), *n.* (١) قوتوی پوشوو و بەردئەستێ و چەخماخ (٢) شتێك یا شوێنێکی زووگرگر؛ بارودۆخێکە کە بە ئاسانی دەتەقێتەوە؛ شوێنێکە کە بە ئاسانی شەڕی تێدا هەڵدەگیرسێ؛ کەسێکی زووهەڵچوو
**tine** (tīn), *n.* نووکی تیژ: حوقول *( the ~s of a fork)*.
**tinea** (tin′i-ə), *n.* نەخۆشییەکی پێستە
**tineid** (tin′i-id), *n.* چەند جۆرە موریانەیەکی بچووکن.
**tin-foil** (tin′foil′), *n. Also* **tin foil,** وەرەقی چا؛ وەرەقی ئەلەمنیۆم.
**ting** (tiŋ), *n.* زرنگە؛ زرە
*v.t. & v.i.* زرنگانەوە؛ زرەهاتن
**ting-a-ling** (tiŋ′ə-liŋ′), *n.* زرەی زەنگی بچووك
**tinge** (tinj), *v.t.* (١) ڕەنگ کردن (بە ئاستەم).
(٢) پێوە دیاربوون؛ بۆن لێ هاتن (مەجاز)؛ کارتێکردن
*( His admiration was ~d with envy.)*
*n.* (١) ڕەنگ (بەتایبەتی کەم)؛ ڕەنگ کردنێکی کەم.
(٢) نیشانە: بۆن (مەجاز)؛ جێ نیشان؛ شوێنکار.
**tingle** (tiŋ′g'l), *v.i.* چووزانەوە؛ تووزانەوە؛ مێرووله‌کردن؛ مووچرکە پیاهاتن
*( His cheek ~d from the slap.;*
*She was ~ing all over with joy.)*
*v.t.* تووزاندنەوە؛ مووچرکە پیاهێنان؛ مێرووله پێ کردن
*n.* مێروولەکردن؛ مووچرکە؛ تووزانەوە؛ چووزانەوە.
**-tingler** *(n.)*; **tingly** *(adj.).*
**tin hat,** [Slang]. کڵاوزرێ؛ کڵاوی ئاسن
**tinhorn** (tin′hôrn′), *adj.* [Slang]. خۆهەڵکێش بەتایبەتی بێ پووڵێك کە لاف وگەزافی پارەداری لێ بدات).
**tinker** (tiŋ′kēr), *n.* (١) تەنەکەچی: تەنەکەساز؛ مسگەر
(٢) هەمەکارە: هەمەپیشە (٣) کارنەزان؛ ناکارامە (٤) کارنەزانی؛ ناکارامەیی.
(٥) بەچکە ماسی (٦) ماکرێل silversides
*v.i.* (١) مسگەری کردن؛ تەنەکەچێتی کردن (٢) کاری نەزانانە کردن.
(٢) خنەخڕ کردن؛ خۆ خەریك کردن بە شتی هیچ‌وپووچەوە.
**tinker's damn** (or **dam**), شتێکی بێ نرخ؛ شتێکی هیچ‌وپووچ.
**tinkle** (tiŋ′k'l), *v.i.* زرە (لێ) هاتن؛ زرنگانەوە؛ جرنگەهاتن.
*v.t.* (١) زرە لێوە هستان؛ زرنگاندنەوە؛ جرنگاندن
(٢) بە زرە یا زرنگانەوە پیشاندان (کات).
*n.* (١) زرەهاتن؛ زرنگانەوە؛ جرنگانەوە. (٢) زرنگە؛ زرە؛ جرنگە.
**-tinkly** *(adj.).*
**tinman** (tin′mən), *n.* = tinsmith.
**tinned** (tind), *adj.* (١) بە تەنەکە ڕووکەش کراو
(٢) [British]: کراوەتە قوتووەوە بۆ پاراستنی (خواردەمەنی).
**tinner** (tin′ēr), *n.* (١) کرێکاری کانە تەنەکە. (٢) tinsmith .
(٣) [British]: کەسێکە کە خواردەمەنی دەکاتە قوتووەوە بۆ پاراستنی
**tinnitus** (ti-nī′təs, tin′i-təs), *n.* گوێ زرنگانەوە (نەخۆشی)
**tinny** (tin′i), *adj.* (١) تەنەکەیی؛ هی تەنەکە؛ تەنەکەی تێدایە یا لێی دەردەهێنرێ. (٢) سووك و ناسك؛ بەرگەنەگر؛ هەرزانبەها.
(٣) دەنگی تەنەکەی لێوە دێت. (٤) تامی تەنەکە دەدات (خواردنی قوتو).
**-tinnily** *(adv.)*; **tinniness** *(n.).*
**Tin Pan Alley,** *Also* tin-pan alley, (١) گەڕەکی ئەوانەی کە مۆسیقای هەرزەکی دادەنێن و لێدەدەن و بڵاودەکەنەوە. (٢) کۆمەڵێك لەوانەی پیشەیان دانان و لێدان و بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە مۆسیقایەیە.
**tin-plate** (tin′plāt′), *v.t.* ڕووکەش کردن بە تەنەکە.
**tin plate,** پەرەی ئاسن و پۆڵای بە تەنەکە ڕووکەش کراو.
**tinsel** (tin′s'l), *n.* (١) قوماشی خوری نەخشێنراو بە دەزووی زەرکەش.
(٢) شریت و کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ بۆ ڕازاندنەوە بەبۆنەی کریسمەس و ئاهەنگەوە
(٣) شتی بریقەدار و بێ نرخ.
*adj.* (١) بە شریت و کاغەزی ڕەنگاوڕەنگی ڕازێنەرەوە کراو یا ڕازێنراوە.
(٢) بریقەدار و هەرزانبەها؛ زەق.
*v.t.* (١) بە شتی بریقەدار و زەق و هەرزانبەها ڕازاندنەوە.
(٢) بە ڕووکەش جوان نواندن.
**tinsman** (tinz′mən), *n.* = tinsmith.
**tinsmith** (tin′smith′), *n.* تەنەکەچی؛ تەنەکەساز؛ مسگەر
**tinstone** (tin′stōn′), *n.* = cassiterite.
**tint** (tint), *n.* (١) ڕەنگ؛ ڕەنگی کاڵ.
(٢) پلەیەك لە پلەکانی ڕەنگ (لەرووی تۆخییەوە). (٣) نیشانە.
(٤) ڕوویەکی کاڵ بۆ لەسەر چاپکردنی وێنە (چاپەمەنی).
(٥) بۆیەی قژ؛ بۆیەی سەر.
*v.t.* ڕەنگ کردن بە ئاستەم؛ بۆیە یا ڕەنگ لێدان بە ئاستەم (قژ، سەر).
**tintinnabular** (tin′ti-nab′yoo-lēr), *adj. Also* **tintinnabulary, tintinnabulous,** هی زەنگ و زەنگ لێدان؛ زەنگی؛ زرنگەیی.
**tintinnabulation** (tin′ti-nab′yoo-lā′shən), *n.* زرە یا دەنگی زەنگ؛ زرنگەی زەنگ.
**tinware** (tin′wâr′), *n.* قاپ و قاچاغی تەنەکە؛ دەفری تەنەکە.
**tinwork** (tin′wûrk′), *n.* (١) شتی لە تەنەکە دروستکراو؛ شتی تەنەکە. (٢) *(pl.)*، تەنەکەخانە؛ کارگەی تەنەکە.
**tiny** (tī′ni), *adj.* بچکۆلە؛ گچکەلە؛ ئێجگار بچووك.
**-tion** (shən), پاشگرێکە بەمانای: کردار؛ بوون:
*( absorption, creation)*
**tip** (tip), *n.* (١) نووك؛ سەر؛ زمانە *( the ~ of the finger, toe)* .
(٢) بۆیە؛ لووتکە؛ تەپڵەسەر؛ تەوقەسەر.
*v.t.* (١) نووك بۆ کردن؛ دادان؛ داتاشین. (٢) قنچك کردن.
(٣) ڕازاندنەوە یا بۆیەدان لە نووك یا سەری شتێك.
(٤) ( **in** ~ )، پەڕەیەکی زیادە خستنە کتێبەوە و بە کەتیرە پێوەلکاندنی.
**tip** (tip), *v.t.* بە ئەسپایی لێدان؛ پەلەپیتکە لێدان؛ دەست پیاکێشان بە ئەسپایی.
*n.* لێدان بە ئەسپایی؛ پەلەپیتکە.
**tip** (tip), *v.t.* (١) هەڵگەڕاندنەوە؛ سەرەوخوارکردن.
(٢) لارکردنەوە؛ خوارکردنەوە
(٣) قەراغی شەپقە نەختێك بەرزکردنەوە لە سڵاوکردندا: *( to ~ one's hat)* .
*v.i.* (١) لاربوونەوە؛ خواربوونەوە.

(٢) ( ~ over )، هەڵگەڕانەوە؛ سەرەوخواربوونەوە؛ وەرگەڕان.

***n.*** لاری؛ خواری؛ لاربوونەوە؛ خواربوونەوە.

**tip** (tip), ***n.*** (١) بەخشیش؛ شاگردانە. (٢) (ا) سووسە؛ ئاگاداری نهێنی.
(ب) ئامۆژگاری؛ پێشنیاری بەکەڵك؛ سەرنجی بەسوود.

***v.t.*** (١) بەخشیش پێدان؛ شاگردانە پێدان.
(٢) ( ~ off )، سووسە پێ گەیاندن؛ ئاگادارکردن؛ دەنگوباسی نهێنی پێدان.

***v.i.*** بەخشیش دان؛ شاگردانە دان: *( He ~s lavishly.)*.

**-tipper** *(n.)*.

**tip cart,** عەرەبانەیەکی دەستییە کە خوار دەکرێتەوە بۆ هەڵڕشتنی ئەو شتەی تێدایەتی.

**tipi** (tēp′i), ***n.*** = **tepee.**

**tip-off** (tip′ôf′), ***n.*** (١) سووسە پێ گەیاندن (بەتایبەتی لە گرەو بردنەوە لە غارغارێنی ئەسپ و یاریدا)؛ سووسەکردن؛ ئاگادارکردن.
(٢) (ا) سووسە؛ ئاگاداری نهێنی.
(ب) سەرنجی بەکەڵك؛ ئامۆژگاری؛ بیروڕای بەکەڵك.

**tippet** (tip′it), ***n.*** (١) فەقیانە؛ چمکی شۆڕی قۆڵی کراس و تەپلە و پاڵتۆ... هتد. (٢) (ا) ملپێچ؛ ملپێچی شۆڕبووەوە.
(ب) ملپێچی ڕەشی قەشەی کڵێسەی ئینگلیزی.

**tipple** (tip′'l), ***v.i. & v.t.*** عەرەق زۆر خواردنەوە؛ خووگرتن بە عەرەق خواردنەوەوە

***n.*** عەرەق؛ مەی؛ خواردنەوەی ئەلکحول.

**-tippler** *(n.)*.

**tipple** (tip′'l), ***n.*** (١) ئامێری هەڵگەڕاندنەوەی لۆری بۆ بار ڕۆکردن.
(٢) شوێنی ئەم هەڵگەڕانەوە و بارداگرتنە.

**tipstaff** (tip′staf′, tip′stäf′), ***n.*** (١) داردەستی سەر ئاسن.
(٢) پۆلیسی دادگا.

**tipster** (tip′stēr), ***n.*** سووسەپێدەر؛ خەبەردەر؛ هەواڵی نهێنی پێدەر (پارەبازی و گرەوکردن).

**tipsy** (tip′si), ***adj.*** (١) شلۆق؛ لەرزۆك. (٢) خوار؛ لار.
(٣) سەرخۆش؛ مەست؛ لەتر دەدات.

**-tipsily** *(adv.)*; **tipsiness** *(n.)*.

**tiptoe** (tip′tō′), ***n.*** نووکی پەنجەی پێ؛ نووکی پێ؛ سەری پەنجەی قاچ.

***adj.*** (١) لەسەر نووکی پێ وەستاو (٢) بەپەرۆش.
(٣) بێ خشپە؛ بەدزییەوە؛ بەبێ دەنگ؛ وریا.

***adv.*** لەسەر نووکی پێ

***v.i.*** لەسەر نووکی پێ ڕۆیشتن؛ بەبێ دەنگ یا بێ خشپە ڕۆیشتن.

**on tiptoe,** (١) لەسەر نووکی پێ (٢) بەپەرۆشەوە؛ بەپەرۆش.
(٣) بەبێ خشپە؛ بەبێ دەنگ؛ بە پەنهانی.

**tiptop** (tip′top′), ***n.*** (١) ۆپە؛ لووتکە؛ تەپڵەسەر.
(٢) باشترین؛ نایاب؛ زۆر باش.

***adj. & adv.*** (١) لە ۆپە یا تەپڵەسەردا؛ لە بەرزترین شوێندا.
(٢) نایاب؛ زۆر باش: *( a ~ concert; He is in ~ shape.)*.

**tirade** (tī′rād, ti-rād′), ***n.*** ووتارێکی دوورودرێژو توندوتیژی هێرش بردنە سەر.

**tire** (tīr), ***v.i.*** (١) ماندووبوون؛ هیلاك بوون؛ پڕووکان.
(٢) بێزاربوون؛ لەبەرچاوکەوتن؛ وەڕس بوون؛ تاقەت چوون.

***v.t.*** (١) ماندووکردن؛ هیلاك کردن؛ پڕووکاندن.
(٢) بێزارکردن؛ وەڕس کردن؛ بێ تاقەت کردن.

**tire of,** لێ بێزاربوون؛ لێ وەڕس بوون؛ لەبەرچاوکەوتن؛ لێ بێ تاقەت بوون *( He tired of reading.)*.

**tire out,** پڕووکاندن؛ زۆر ماندووکردن

**tire** (tīr), ***n.*** تایە

**tire** (tīr), ***v.t.*** [Archaic]. جل لەبەرکردن

***n.*** [Archaic]. (١) جل و بەرگ (٢) سەرپێچی ژن.

**tired** (tīrd), ***adj.*** (١) (ا) ماندوو؛ هیلاك. (ب) بێزار؛ وەڕس؛ بێ تاقەت.
(٢) سوواو؛ پەڕپووت؛ کۆن و باو نەماو.

**tireless** (tīr′lis), ***adj.*** ماندوو نابێ؛ کۆڵنەدەر؛ بەکێش.

**-tirelessly** *(adv.)*; **tirelessness** *(n.)*.

**tiresome** (tīr′səm), ***adj.*** ووشك و ناخۆش؛ بێزارکەر؛ ماندووکەر: *( a ~ person, job, speech, etc.)*

**tirewoman** (tīr′woom′ən), ***n.*** [Archaic], کەنیزەك؛ کارەکەر.

**tiring room,** ژووری خۆگۆڕین (بەتایبەتی لە شانۆدا)؛ ژووری جل لەبەرکردن.

**tiro** (tī′rō), ***n.*** = **tyro.**

**tisane** (ti-zan′), ***n.*** خواردنەوەی گیای دەرمان و بۆن خۆش.

**tissue** (tish′ōō, tish′oo), ***n.*** (١) کرێشە؛ برنجۆك؛ قوماشی زۆر تەنك.
(٢) ڕستە؛ ڕیز؛ تەون: *( His excuse was a ~ of lies.)*.
(٣) **tissue paper**.
(٤) ڕیشاڵ؛ شانە (لەش)؛ تێشوو.

**tissue paper,** دەسەسڕی کاغەز؛ کاغەزی خۆ پاکردنەوەی ئاودەست.

**tit** (tit), ***n.*** باڵندەیەکی بچووکە وەك چۆلەکە. (هەروەها " **titmouse** ").

**tit** (tit), ***n.*** (١) گۆی مەمك. (٢) مەمك؛ مەمە (لەڕووی سووکییەوە).

**tit** (tit), ***n.*** (١) گەندە ئەسپ؛ ئەسپی بچووکی پەککەوتوو
(٢) [Slang]، کچ (لەڕووی سووکییەوە)؛ ئافرەت.

**tit** (tit), ***n.*** لێدان؛ پیاکێشان.

**tit.,** = **title.**

**Titan** (tī′t'n), ***n.*** (١) (ا) یەکێکە لە خواکانی کۆنی یۆنان.
(ب) نەوەی ئەم خوایانە. (٢) خوای ڕۆژ.
(٣) کەسێك یا شتێکی زۆر زل و بەهێز.

***adj.*** زۆر زل و بەهێز.

**titanate** (tī′tə-nāt′), ***n.*** خوێی ترشی تیتانیك (کیمیا).

**Titanic** (tī-tan′ik), ***adj.*** (١) تایتانی: وەك خواکانی کۆنی یۆنان (ئەفسانەی یۆنانی). (٢) [t-]، زۆر زل و بەهێز.

**titanic** (tī-tan′ik, ti-tan′ik), ***adj.*** تیتانیۆمی (کیمیا).

**titanic acid,** ترشی تیتانیك (کیمیا).

**titaniferous** (tī′tə-nif′ēr-əs), ***adj.*** تیتانیۆمی: تیتانیۆمی تێدایە (کیمیا).

**Titanism** (tī′t'n-iz'm), ***n.*** *Also* **titanism,** هەستی یاخی بوون و هەڵگەڕانەوە لە نەریتی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری کۆن.

**titanite** (tī′tə-nīt′), ***n.*** = **sphene.**

**titanium** (tī-tā′ni-əm, ti-tā′ni-əm), ***n.*** تیتانیۆم: توخمێکی کانزاییە (کیمیا).

**titanous** (tī-tan′əs, ti-tan′əs), ***adj.*** تیتانیۆمی: تیتانیۆمی تێدایە (کیمیا).

**titbit** (tit′bit′), ***n.*** = **tidbit.**

**titer** (tī′tēr, tī′tēr), ***n.*** *Also* **titre,** پێوانەی قەبارەیی (کیمیا) (ووشەی " **titration** " ببینە).

**tit for tat,** یەك بە یەك (تۆڵەسەندن).

**tithable** (tīth′ə-b'l), ***adj.*** باجی دەیەکی لەسەرە (ووشەی داهاتوو ببینە).

**tithe** (tīth), ***n.*** (١) دەیەك: باجی بەروبوومی زەوی یا داهات کە دەدرێ بە کڵێسە. (٢) دەیەك؛ بەشێکی زۆر کەم. (٣) باج.

***v.t.*** (١) دەیەکی داهات یا بەروبوومی زەوی دان (بەتایبەتی بە کڵێسە)
(٢) باجی دەیەك خستنە سەر یا سەندن.

**tithing** (tīth′iŋ), ***n.*** (١) باجی دەیەك دان؛ باجی دەیەك سەندن.
(٢) **tithe**.
(٣) کەرتێکی شارەوانی کۆنی ئینگلتەرەیە کە لە دە ماڵ پێکدەهات.

**titi** (tē′ti), ***n.*** تیتی: دەوەنێکی هەمیشە سەوزی خوارووی ئەمەریکایە گوڵی بۆن خۆشی سپی و پەمەیی دەگرێ.

**titi** (ti-tē′), *n.* تیتی جۆرە مەیموونێکی بچووکی ئەمەریکای باشوورە.
**titian** (tish′ən, tish′i-ən), *n. & adj.* پرتەقاڵیی قاوەیی
**titillate** (tit′'l-āt′), *v.t.* (١) ختووکەدان.
(٢) هێنانەجۆش؛ وورووژاندن؛ هەست جووڵاندن.
**-titillatingly** *(adv.)*; **titillation** *(n.)*; **titillative** *(adj.)*.
**titivate, tittivate** (tit′ə-vāt′), *v.t. & v.i.* [Colloq.], قۆزکردن؛
خۆ شۆخ کردن؛ ساف‌ولووس کردن؛ تیفەتیف دان.
**-titivation; tittivation** *(n.)*.
**titlark** (tit′lärk′), *n.* = **pipit.**
**title** (tī′t'l), *n.* (١) ناو (کتێب، هەڵبەست، ووتار، فیلم... هتد).
(٢) سەرووتار؛ سەرباس؛ سەردێر. (٣) **title page**.
(٤) ناونیشان.
(٥) سەرناو؛ نازناو: *( an honorary ~ ; the ~ of "Lord" )*.
(٦) ماف.
(٧) تاپۆ: *( to have the ~ to a house)*
(٨) ناوی یاسایەك.
(٩) پاڵەوانێتی (یاری بردنەوە)؛ بردنەوەی دوا پێشبڕکێ:
*( Their team won the ~ .)*
*v.t.* (١) ناونێنان؛ ناونیشان لێنان؛ نازناو پێدان.
(٢) سەرباس یا سەردێڕ خستنەسەر
**titled** (tīt'ld), *adj.* سەرناودار (بەتایبەتی هی بەگزادەیی)؛ نازناودار.
**title deed,** تاپۆ
**title page,** پەڕەی ناونیشان (کە ناوی دانەرو کتێبەکەو بڵاوکەرەوەکەی تێدایە).
**title role ( or part),** ئەو بوونەرەی شانۆگەری یا فیلمێکە کە شانۆگەرییەکە یا فیلمەکەی بەناوەوە ناودەنرێ.
**titman** (tit′mən), *n.* (١) بچووکترین بەچکە بەرازی بە یەك سك زاو.
(٢) کەسێکی گوڵ یا کورتەبنە.
**titmouse** (tit′mous′), *n.* باڵندەیەکی بچووکی بۆری پۆپنە تیژە ئەوەندەی چۆلەکەیەکە.
**titrate** (tī′trāt, tit′rāt), *v.t.* شیکردنەوەی قەبارەیی (کیمیا).
**titration** (tī-trā′shən, ti-trā′shən), *n.* شیکردنەوەی قەبارەیی: دۆزینەوەی ڕادەی بوونی توخمێك لە ناوێتەیەکدا (کیمیا).
**titre** (tī′tēr, ti′tēr), *n.* = **titer.**
**tit-tat-toe** (ti′ta-tō′), *n.* = **tick-tack-toe.**
**titter** (tit′ēr), *v.i.* حیلکەحیلك هاتن؛ تریقانەوە.
*n.* حیلکەحیلك؛ تریقەتریق.
**tittivate** (tit′ə-vāt′), *v.t. & v.i.* = **titivate.**
**tittle** (tit′'l), *n.* (١) خاڵ‌وبۆر (٢) نەختێك؛ تۆزێك؛ تۆسقاڵ؛ نەختاڵ.
**tittle-tattle** (tit′'l-tat′'l), *n.* چەنەبازی؛ چەنەدان؛ چڵتەچەلت
**tittup** (tit′əp), *n.* خۆبادان؛ بە ترۆفیزەوە ڕۆیشتن؛ هەڵتووزان.
*v.i.* یاری کردن‌و هەڵتووزان؛ خۆ نوواندن؛ فیز لێدان.
**titty** (tit′i), *n.* مەمك؛ مەمە (قسەی منداڵ یا لەڕووی سووکییەوە).
**titubation** (tich′oo-bā′shən), *n.* لەتردان (نەخۆشی هەستەدەمار).
**titular** (tich′oo-lēr, tit′yoo-lēr), *adj.* (١) تایبەتی بە ناو یا ناونیشان (٢) نازناودار؛ ناودار؛ ناونیشاندار
(٣) هەر بەناو؛ تەنها لەڕووی ڕێزو ناوەوەیە نەك بە ڕاستی:
*( a ~ King; a ~ head of the party)*
(٤) لە ناوی ئەوەوە وەرگیراوە: *( the ~ character of a novel)*.
(٥) تایبەتی بە کڵێسەیەکی کۆنی نزیك ڕۆما کە سەرەك قەشە نازناوەکەی لێوە وەردەگرێ
*n.* کەسێکە کە هەر بە ناو پلەوپایەیەك یا نازناوێکی هەبێ؛ کەسێکی نازناودار.
**-titulary** *(adj.)*.
**tizzy** (tiz′i), *n.* [Slang], شپرزەیی (بەهۆی شتێکی هیچ‌وپووچەوە)؛ سەر لێ شێوان؛ وورووژان.

**tmesis** (tmē′sis, mē′sis), *n.* جیاکردنەوەی ووشەیەکی لێکدراو بە تێخستنی ووشەیەکی تر: ( **" what person soever "** بۆ **" whatsoever person "** ).
**TNT, T.N.T., = trinitrotoluene.**
**to** (tōō ; *unstressed* too, tə), *prep.* (١) (ا) بۆ:
*( He went ~ school, London, etc.)*
(ب) بەرەو.
(٢) هەتا؛ تا: *( rotten ~ the core)*.
(٣) (ا) بەرەو (بارودۆخێك)؛ بۆ:
*( He grew ~ manhood. her rise ~ fame)*
(ب) هەتا: *( starved ~ death)*.
(٤) لە: *( Apply the lotion ~ the skin.; a house ~ the right)*
(٥) هەتا (کات)؛ تا: *( I will be home from two ~ four.)*.
(٦) بۆ (مەبەست): *( She worked ~ that end.)*.
(٧) هی؛ – ی: *( the key ~ the house)*.
(٨) بەرامبەر بە؛ بە: *( The score was seven ~ one.)*.
(٩) پێ (پێ ووتن، پێدان... هتد)؛ بە: *( Tell it ~ me.)*.
(١٠) گونجان؛ ڕێکەوتن؛ بەپێی: *( not ~ my taste)*.
(١١) بۆ (بادەنۆشی بۆ کەسێك یا شتێك): *( a toast ~ your success)*
(١٢) لەگەڵ؛ بە: *( parallel ~ the road)*.
(١٣) لەبەردەم؛ بە: *( face ~ face)*.
(١٤) لە ئەوەندە پێکدێت: *( four quarts ~ a gallon)*.
(١٥) بۆ (کات)؛ لەپێش: *( ten minutes ~ eight)*.
(١٦) [Colloq.]، بە: *( a field planted ~ corn)*.
(١٧) لەگەڵ کرداردا چاووگ پێکدێنێت (ڕێزمان):
*( T~ live is sweet. It is easy ~ do. T~ err is human.)*
*adv.* (١) هۆش هاتنەوەبەر خۆ: *( He came ~ .)*.
(٢) یەکسەر دەستپێکردن: *( We sat down ~ lunch and fell ~ .)*
(٣) بەرەو با (کەشتیوانی).
**to and fro,** هاتوچۆ؛ هاتن‌و چوون؛ ئەم سەرو ئەوسەر.
**toad** (tōd), *n.* (١) گیانەوەرێکە لە توخمی بۆق پێستی ووشك‌و زبرە لە ووشکانیدا دەژی جگە لە کاتی زاوزێدا؛ جۆرە بۆقێکی گەورەیە.
(٢) کەسێکی پیسی بۆگەن؛ کەسێکی بێ نرخی هیچ‌وپووچ.
**toadeater** (tōd′ēt′ēr), *n.* = **toady.**
**toadfish** (tōd′fish′), *n.* بۆقەماسی: ماسییەکی بێ پوولەکەی سەرپانە.
**toadflax** (tōd′flaks′), *n.* گیایەکی کێوییە گوڵی زەردی پنکەپنکەیی دەگرێ.
**toadstone** (tōd′stōn′), *n.* بۆقەبەرد: بەردێکە پێشینان وایان داناوە کە لەناو سەر یا لەشی بۆقدا دروست بووەو بۆ چاوەزار بەکارهێنراوە.
**toadstool** (tōd′stōōl′), *n.* قارچکی ژەهراوی.
**toady** (tōd′i), *n.* کاسەلێس؛ مەراییکەر؛ کلکەلەقێکەر.
*v.t. & v.i.* کلکەلەقێ کردن؛ مەراپی کردن.
**toadyism** (tōd′i-iz'm), *n.* کلکەلەقێ؛ مەرایی؛ کاسەلێسی.
**to-and-fro** (tōō′ən-frō′, tōō′ənd-frō′), *adj.* هاتوچۆ؛ ئەم سەرو ئەوسەر
**toast** (tōst), *v.t.* (١) برژاندن (نان).
(٢) گەرم کردنەوە: *( T~ yourself by the campfire.)*.
*v.i.* (١) برژان. (٢) باش گەرم بوونەوە.
*n.* پارچە نانی برژاو: *( to have a piece of ~ )*.
**toast** (tōst), *n.* (١) ئەو کەسە یا شتەی بادەنۆشی بۆ دەکرێ.
(٢) بادەنۆشی. (٣) بادەی بادەنۆشی (لە ڕێزی کەسێك یا شتێکدا).
*v.t.* پێشنیازی بادەنۆشی کردن.
*v.i.* بادەنۆشین.
**toaster** (tōs′tēr), *n.* نانبرژێنی کارەبایی.

**toaster** (tōs′tẽr), ***n.*** پێشنیازکەری بادەنۆشی؛ بادەنۆش.
**toastmaster** (tōst′mas′tẽr, tōst′mäs′tẽr), ***n.*** ئاهەنگ گێڕ
**tobacco** (tə-bak′ō), ***n.*** (١) تووتن. (٢) جگەرە؛ سیگار؛ برنووتی.
(٣) جگەرەکێشان؛ تووتن کێشان.
**tobacco heart,** نەخۆشییەکی دڵە لە زۆر جگەرەکێشانەوە تووش دەبێ.
**tobacconist** (tə-bak′ə-nist), ***n.*** تووتنچی؛ جگەرەفرۆش.
**to-be** (tə-bē′, too-bi′), ***adj.*** هی دوارۆژ؛ دوارۆژ: ***( a bride - ~ ).***
**toboggan** (tə-bog′ən), ***n.*** گالیسکە خلیسکە؛ گالیسکە بەفرینە:
گالیسکەیەکی باریکە بۆ سواربوون لە خلیسکەیەکدا، واتە لە جۆگەیەکی لێژی سەهۆڵ و بەستوودا.
***v.i.*** (١) خلیسکان یا ڕۆیشتن بەم جۆرە گالیسکەیە
(٢) لەپڕ شکان؛ لەپڕ بەناخداچوون:
***( Prices ~ed. ; His good fortune ~ed.)***
**-tobogganer; tobogganist *(n.)*.**
**toby** (tō′bi), ***n.*** *Also* Toby, (١) کووپێکی گەورەی بیرە خواردنەوەیە
لە شێوەی پیاوێکی قەڵەوی تەپڵەی سێگۆشە لەسەردایە.
(٢) [Slang]. سیگارێکی باریک و درێژی هەرزانبەهایە.
**toccata** (tə-kä′tə), ***n.*** ئاوازێکی مۆسیقایە بۆ لێدان بە پیانۆ یا ئۆرگان
**tocology, tokology** (tō-kol′ə-ji), ***n.*** پزیشکایەتی منداڵبوون؛
مامانی
**tocsin** (tok′sin), ***n.*** (١) زەنگی وریاکردنەوە.
(٢) زرنگ یا زرەی ئەم زەنگە.
(٣) وریاکردنەوە؛ هاوار؛ نوقڵانە؛ نیشانەی ڕووداوی دوارۆژ.
**tod** (tod), ***n.*** (١) پێوانەیەکی کۆنی ئینگلیزی خوریە بریتییە لە
بیست و هەشت پاوەند (٢) بنچکە لاولاوی پڕ
**tod** (tod), ***n.*** [Scot.]. ڕێوی
**today** (tə-dā′, too-dā′), ***adv.*** (١) ئەمڕۆ؛ ئیمڕۆ؛ ئیمڕۆکە.
(٢) ئێستا؛ ئەم ڕۆژانە؛ لەم چەرخەدا
***n.*** (١) ئەمڕۆ؛ ئیمڕۆ؛ ئیمڕۆکە (٢) ئێستا؛ ئەم ڕۆژانە؛ لەم چەرخەدا.
**toddle** (tod′'l), ***v.i.*** بە پێ ڕۆیشتن وەک منداڵی ساوا؛
وەک پێڕەوکە ڕۆیشتن.
***n.*** وەک منداڵی تازە پێگرتوو ڕۆیشتن
**toddler** (tod′lẽr), ***n.*** (١) پێڕەوکە
(٢) حلی منداڵی یەک ساڵە هەتا سێ ساڵە.
**toddy** (tod′i), ***n.*** (١) ئاووگی هەندێ دارخورمایە دەخورێتەوە.
(٢) خواردنەوەیەکی مەستکەرە بە ترشاندنی ئەم ئاووگە دەکرێت.
(٣) تۆدی: خواردنەوەیەکی ئەختێک تووندە لە براندی و شەکر و ئاوی گەرم و بەهارات دەکرێت
**to-do** (tə-do͞o′, too-do͞o′), ***n.*** [Colloq.]. هاتن و چوون بە شێرزە؛
هەڵاهەڵا؛ هەراهەرا: ***( They made a great ~ over the dinner.)*** .
**tody** (tō′di), ***n.*** باڵندەیەکی بچووکی چۆلەکە ئاساییە پەڕەکەی سەوزە و
گەردنی سوور.
**toe** (tō), ***n.*** (١) پەنجەی پێ؛ ئەمووستی پێ؛ قامکی پێ.
(٢) سم؛ سمی وڵاخ (٣) نووکی پێ (٤) نووکی پێڵاو و گۆرەوی.
(٥) (ا) سەری داری گۆڵف.
(ب) هەرشتێک لە شێوە و کاردا لە پەنجەی پێ بچێ
***v.t.*** (١) شوێنی پەنجە بۆ کردن (گۆرەوی).
(٢) نووکی پێ لێدان؛ بە نووکی پێ یا پێڵاو لێدان.
(٣) (ا) بزمار لێدان بە خواری (ب) قایم کردن بە بزماری خوار داکوتراو.
***v.i.*** نووکی پێ ڕووەو دەرەوە یا ناوەوە دانان لە وەستان و ڕۆیشتندا:
***( He ~s in . She ~s out.)***
**on one's toes,** [Colloq.]. ووریا؛ وریا و ئامادە
**toe the line ( or mark ),** (١) نووکی پێ دانان لەسەر هێڵی
دەستپێکردنی پێشبڕکێ (٢) بە توندی پەیڕەوی کردن؛ بە ووردی فەرمان بەجێهێنان
**toecap** (tō′kap′), ***n.*** نووکی پێڵاو.
**toed** (tōd), ***adj.*** (١) (ا) ئەوەندە پەنجەی پێی هەیە: ***( five- ~ )*** .
(ب) پەنجە یا نووکی پێی شێوەیەکی تایبەتی هەیە: ***( pigeon- ~ )***
(٢) (ا) بە خواری داکوتراو (بزمار). (ب) بە بزماری خوار داکوتراو قایم کراوە
**toe-dance** (tō′dans′, tō′däns′), ***v.i.*** لەسەر نووکی پێ سەماکردن
(سەمای باڵێ).
**toe dance,** سەمای سەر نووکی پێ
**toe hold,** (١) شوێنێ لێ گیربوونی نووکی پێ (لە پیاهەڵگەڕانی شوێنێکدا
(٢) هۆی سەرکەوتن یا پێشکەوتن. (٣) شوێنی پێ کردنەوە.
(٤) پێ بادان (زۆرانبازی)؛ پێ گرتن.
**toe-in** (tō′in′), ***n.*** ڕووی سەری پێچکەی پێشەوەی ئوتومبیل بۆ ناوەوە
کردن.
**toeless** (tō′lis), ***adj.*** (١) بێ پەنجەی پێ
(٢) نووک کراوە (پێڵاو) ***( a ~ shoe)*** .
**toenail** (tō′nāl′), ***n.*** (١) نینۆکی پەنجەی پێ.
(٢) بزماری بە لاری داکوتراو.
***v.t.*** بە بزماری لار داکوتراو قایم کردن یا لێکدان.
**toffee, toffy** (tôf′i, tof′i), ***n.*** چوکلێتی ڕەقی جیر
**toft** (tôft), ***n.*** [British Dial.], (١) شوێنی خانوو.
(٢) خانووبەرە؛ ماڵ؛ ماڵ و زەوی‌وزاری دەوروپشتی (٣) تەپۆلکە؛ گردۆلکە
**tog** (tog, tôg), ***n.*** (١) [Old Slang] ، چاکەت.
(٢) (*pl.*)، [Colloq.]، جل؛ بەرگ: ***( tennis ~s)*** .
***v.t. & v.i.*** [Colloq.], ( **~ up; ~ out** ), جل لەبەرکردن.
**toga** (tō′gə), ***n.*** (١) تۆگە: جبە یا عەبایەکی دەڵبی ئاودامانە لە کۆندا
لە ڕۆما لەبەریان دەکرد. (٢) جبەی ڕەسمی یا پیشەیەک.
**-togaed *(adj.)*.**
**together** (tə-geth′ẽr, too-geth′ẽr), ***adv.*** (١) پێکەوە؛ بەیەکەوە؛
بە کۆمەڵ؛ تێکرا؛ بە تێکڕایی (٢) لەگەڵ یەکتردا:
***( The books were compared ~ .)***
(٣) لە هەمان کاتدا؛ پێکەوە: ***( They arrived ~ .)*** .
(٤) بەردەوام؛ بەبێ وەستان: ***( He worked for eight hours ~ .)***
(٥) ڕێکەوتن؛ پێکهاتن: ***( Get ~ on this.)***
**toggery** (tog′ẽr-i, tôg′ẽr-i), ***n.*** [Colloq.]. (١) جل؛ جل‌وبەرگ.
(٢) دوکانی جل‌وبەرگ؛ فرۆشگای جل.
**toggle** (tog′'l), ***n.*** بزمارێکە دەخرێتە ناو گرێیەک یا قوڵفەیەکەوە بۆ
چەسپاندنی.
**toil** (toil), ***v.i.*** (١) ڕەنج دان؛ ڕەنج کێشان؛ کۆشش کردن؛ ئارەق ڕشتن.
(٢) بە گران ڕۆیشتن؛ بە زەحمەت کردن:
***( They ~ed up the mountain.)***
***v.t.*** بە گران جێبەجێکردن.
***n.*** (١) ئاکۆکی؛ دووبەرەکی؛ شەڕ (٢) ڕەنج؛ کۆشش؛ ئارەق ڕشتن.
(٣) ئیشی گران و ناخۆش
**toil** (toil), ***n.*** (١) تۆڕ (ڕاوکردن) (٢) (*pl.*) ، داو؛ تەڵە.
**toile** (twäl), ***n.*** جۆرە قوماشێکی تەنکە
**toiler** (toi′lẽr), ***n.*** ڕەنجدەر؛ ڕەنجبەر؛ زەحمەتکێش.
**toilet** (toi′lit), ***n.*** (١) مێزی ئارایشت.
(٢) ئارایشت؛ ئارایشتکردن؛ خۆگۆڕین.
(٣) جل‌وبەرگ؛ جل.
(٤) ئاودەست؛ ئاودەستخانە؛ توالێت.
***adj.*** هی ئاودەست؛ هی توالێت: ***( ~ articles; ~ paper)*** .
**make one's toilet,** توالێت کردن؛ خۆشتن و ئارایشتکردن و سەرداهێنان.
**toilet paper,** کاغەزی ئاودەست: کاغەزی خۆ پاک کردنەوەی ئاودەست
**toiletry** (toi′lit-ri), ***n.*** پێویستی توالێت (سابوون و پۆدرە و بۆن).
**toilette** (toi-let′, twä-let′), ***n.*** (١) ئارایشت؛ خۆشتن و ئارایشت
کردن و خۆگۆڕین (٢) جل‌وبەرگ؛ بەرگ؛ جل.

**toilet training,** منداڵ فێری ئاودەست بەکارهێنان کردن.
**toilet water,** کولۆنیا: بۆن
**toilful** (toil′fəl), *adj.* گران: قورس: ماندووکەر؛ بە ئەرك.
**toilsome** (toil′səm), *adj.* گران: قورس: ماندووکەر؛ بە ئەرك.
**-toilsomely** *(adv.)*; **toilsomeness** *(n.)*.
**toilworn** (toil′wôrn′), *adj.* زۆر ماندوو: تین تیا نەماو: هیلاك
**Tokay** (tō-kā′), *n.* (١) جۆرە ترێیەکی شیرینی دەنك زلە دەکرێت بە
مەی (لە ناوچەی " تۆکەی " لە هەنگاریا دەڕوێت).
(٢) شەرابێکی شیرینە لەم ترێیە دەگیرێتەوە
**token** (tō′kən), *n.* (١) نیشانە: هێما
*( This gift is a ~ of my affection.)*
(٢) ناسنامە: نیشانەی ناسینەوە.
(٣) نیشانەی تایبەتی (٤) یادگار.
(٥) تۆکن: پوول یا سکەیەکی ئاسنە لەباتی پارە بەکاردەهێنرێ بۆ کرێی
پاس و تەلەفۆن کردن... هتد.
*v.t.* نیشانەی شتێك بوون.
*adj.* (١) نیشانەیی: هێمایی *( a ~ gesture)*.
(٢) هەر بەناو: کەم؛ هەر بۆ ناو: *( There was a ~ resistance.)*.
**by the same token,** هەروەها: کەوابوو؛ بە هەمان شێوە.
**in token of,** نیشانە بە ئەوە؛ بەڵگە بۆ.
**tokenism** (tō′kən-iz′m), *n.* هەر بەناو و بە درۆ پەیڕەوی کردنی
ڕێبازێك
**token payment,** دانەوەی بەشێکی کەمی قەرزێك وەك نیشانە بە نیازی
دانەوەی هەموو قەرزەکە لە دواڕۆژدا
**tokology** (tō-kol′ə-ji), *n.* = tocology.
**tolbooth** (tōl′bōōth′, tol-bōōth′), *n.* [Scot.], زیندان:
بەندیخانە.
**told** (tōld), *past tense and past participle of* **tell.**
**all told,** بە هەمووی *( There were forty guests all told.)*.
**tolerable** (tol′ēr-ə-b′l), *adj.* (١) چاوپۆشی لێ دەکرێ؛
لێی دەبوورێ: بەرگەی دەگیرێ؛ لەگەڵی هەڵ دەکرێ
(٢) باش: خراپ نییە (٣) [Colloq.]، تەندروستی باشە.
**-tolerability; tolerableness** *(n.)*; **tolerably** *(adv.)*.
**tolerance** (tol′ēr-əns), *n.* (١) لێبووردن: چاوپۆشی؛ چاوپۆشین؛
سنگ فراوانی (٢) بەرگەگرتن؛ دەربردن؛ هەڵ کردن:
*( My ~ of noise is limited.)*
(٣) (أ) بەرهەڵستی دەرمان کردن (لەش، میکرۆب)؛ دەرمان کار تێ نەکردن:
*( He developed a ~ to antibiotics.)*
(ب) بەرهەڵستی لەش بۆ ژەهر.
(٤) جیاوازی ڕێگەدراو لە گەورەو بچووکی و قورسایی و ڕەقی... هتد،
پارچەی ئامێرێك (مەکینەکاری).
**tolerant** (tol′ēr-ənt), *adj.* (١) سنگ فراوان؛ چاوپۆشیکەر؛ لێ بووردە.
(٢) (أ) بەرهەڵستیکەری دەرمان؛ دەرمان کارتێنەکەر.
(ب) بەرهەڵستیکەری ژەهر.
**tolerate** (tol′ə-rāt′), *v.t.* (١) چاوپۆشی کردن: چاو لێ پۆشین؛
لێ بووردن: ڕێگەدان.
(٢) دەربردن: لەگەڵ هەڵ کردن: *( He ~s his brother-in-law.)*.
(٣) دەرمان کار تێ نەکردن؛ بەرهەڵستی دەرمان کردن.
**toleration** (tol′ə-rā′shən), *n.* (١) سنگ فراوانی: لێبووردن؛
چاوپۆشی (٢) چاوپۆشی ئاینی: ڕێگەدان بە هەموو ئاینێك لە وڵاتێکدا
**toll** (tōl), *n.* (١) ڕێگانە: باج یا مزی بە پردا پەڕینەوە یا بە ڕێگاوباندا
ڕۆیشتن (٢) مافی ڕێگانە سەندن؛ مافی سەندنی ئەم باجە.
(٣) کرێی تەلەفۆن کردن بۆ دەرەوەی شار یا وڵات.
(٤) زیان: قوربانی *( The accident took a heavy ~ of lives.)*.
**toll** (tōl), *v.t.* (١) [Dial. or Rare]، بە تەڵە گرتن؛ داو بۆ نانەوە (مەل).
(٢) پەیتا پەیتا زەنگ لێدان (بەتایبەتی هی کڵێسە بە بۆنەی مردنی یەکێکەوە).
(٣) هەواڵ بڵاوکردنەوە یا خەڵك بانگ کردن بەم زەنگە.
(٤) بڵاوکردنەوەی هەواڵی مردنی یەکێك بەم زەنگە.
*v.i.* زرنگە هاتن؛ دەنگدانەوە (زەنگ)؛ لێدان.
*n.* (١) زەنگی کڵێسە لێدان؛ زرنگەی پەیتا پەیتای زەنگی کڵێسە.
(٢) یەك زرنگەی ئەم زەنگە
**tollage** (tōl′ij), *n.* (١) ڕێگانە؛ مز یا باجی لە پرد پەڕینەوە یا
بە ڕێگاوباندا ڕۆیشتن. (٢) داواکردن و دانی ئەم مزە.
**toll booth,** (١) قەفەزەی ڕێگانە یا مز وەرگرتن بۆ لە پرد پەڕینەوە.
(٢) **tolbooth**.
**toll bridge,** باجە پرد: پردێکە ئەو ئوتومبیلەی لێی دەپەڕێتەوە باجی
لێ دەسەنرێ.
**toll call,** تەلەفۆنی دەرەوە: تەلەفۆن کردنێکە بۆ دەرەوەی شار و وڵات
بە پارە.
**toll collector,** باجگری سەر پرد و ڕێگەوبانێك کە باج لە ئوتومبیل
دەسەنن.
**toller** (tōl′ēr), *n.* (١) سەگی ڕاوە مراوی.
(٢) زەنگ لێدەری کڵێسە بە بۆنەی مردنی یەکێکەوە. (٣) زەنگی کڵێسە
**tollhouse** (tōl′hous′), *n.* (١)ماڵی باجگری سەر پرد کە لە نزیك
شوێنی باج گرتنەکەوەیە. (٢) **tollbooth**.
**tollkeeper** (tōl′kēp′ēr), *n.* = toll collector.
**toll line,** هێڵی تەلەفۆنی دەرەوەی شار و وڵات.
**toll road,** باجە ڕێ: ڕێگەوبانێکە ئەو ئوتومبیلەی پێیدا بڕوات باجی
لێ دەسەنرێ.
**tolu** (tō-lōō′), *n.* تۆلو: ڕۆنێکی بۆن خۆشە لە داری " تۆلو " ی
ئەمەریکای باشوور دەردەهێنرێ. (پێشی دەوترێ: " **tolu balsam** ")
**toluene** (tol′ū-ēn′), *n.* تۆلۆوین: شلەیەکی بێ ڕەنگە لە خەڵووزو
خەڵووزی بەردینی قیری دەردەهێنرێ لە دروستکردنی بۆیە و تەقەمەنیدا
بەکاردەهێنرێت و هەروەها بۆ شت تواندنەوەیش بەکاردێت.
**toluic acid,** ترشی تۆلۆوین (کیمیا).
**toluidine** (tol-ū′ə-dēn′), *n. Also* **toluidin,** تۆلویدین:
ئاوێتەیەکە لە " تۆلۆوین " دەردەهێنرێ و لە دروستکردنی بۆیە و دەرماندا
بەکاردەهێنرێ.
**toluol** (tol′ū-ōl′, tol′ū-ol), *n.* = **toluene.**
**tolu tree,** داری تۆلو: درەختێکی گەورەی ئەمەریکای باشوورە ڕۆنێکی
بۆن خۆشی لێ دەگیرێ لە بۆن و دەرماندا بەکاردەهێنرێ.
**tom** (tom), *n.* نێرەی هەندێ گیانەوەر (بەتایبەتی پشیلە)؛ نێرە پشیلە.
*adj.* نێرە: *( a ~ turkey)*.
**tomahawk** (tom′ə-hôk′, tom′i-hôk′), *n.* تەور؛ جۆرە تەورێکە
هیندییە ئەمەریکاییەکان بۆ ئیش و وەك چەکیش بەکاریان دەهێنا.
*v.t.* بە تەور بڕینەوە، لێدان، یا کوشتن.
**bury the tomahawk,** ئیتر شەڕ نەکردن؛ ئاشتبوونەوە.
**Tom and Jerry,** خواردنەوەیەکی گەرمی مەستکەرە لە " ڕەم " و
شەکر و هێلکەو شیر یا ئاو دەکرێت.
**tomato** (tə-mā′tō, tə-mä′tō), *n.* (١) تەماتە.
(٢) ڕووەکی تەماتە. (٣) [Slang]، ژن؛ کچ
**tomb** (tōōm), *n.* (١) گۆڕ؛ ئارامگا؛ قەبر. (٢) کێل؛ کێلەبەرد.
*v.t.* [Rare]. ناشتن.
**the tomb,** مەرگ؛ مردن.
**tombac, tomback** (tom′bak), *n.* تومباك: ئاوێتەی مس و
چینکۆیە خشڵی هەرزانبەهای لێ دروست دەکرێ.
**tomboy** (tom′boi′), *n.* کوڕانی؛ کچە کوڕانی؛ نێرە کوڕانی؛
نێرە کچ: خلە کوڕانی.
**-tomboyish** *(adj.)*.
**tombstone** (tōōm′stōn′), *n.* کێل؛ کێلە بەرد؛ کێلە قەبر.

**tomcat** (tom′kat′), *n.* نێرە پشیلە.

**tomcod** (tom′kod′), *n.* ماسییەکی بچووکی دەریایە.

**Tom, Dick, and Harry,** هەموو عەلەو جەلەیەك؛ هەموو کەس (لەڕووی سووکییەوە)؛ هەرچی هەیەو نییە. (وشەی " every " لە پێشییەوە دادەنرێ).

**tome** (tōm), *n.* (١) بەرگ: بەرگی پەرتووکێکی چەند بەرگی.
(٢) پەرتووکێکی گەورە.

**-tome** (tōm), پاشگرێکە بەمانای: بڕین؛ بڕ: *( microtome)* .

**tomentose** (tō-men′tōs), *adj.* بە کەندەمووی چنگ بەیەکداچوو داپۆشراوە (ڕووەکناسی، گیانەوەرناسی).

**tomentum** (tō-men′təm), *n.* (١) کەندەمووی چنگ بەیەکداچوو کە بە لاسك و گەڵای هەندێ ڕووەکەوەیە. (٢) چەند دەزوولەیەکی خوێنی تێکهەڵکێشراون لە پەردەی مێشك و مۆخی بڕبڕەدا

**tomfool** (tom′fo͞ol′), *n. & adj.* گەوج؛ کەر؛ بێ مێشك

**tomfoolery** (tom′fo͞ol′ēr-i), *n.* (١) گەوجێتی؛ کەرێتی؛ بێ مێشکی (٢) قسەی قۆڕ؛ شتی هیچ‌وپووچ و بێ مانا.

**tommy** (tom′i), *n.* [British Colloq.], (١) نەواشە؛ نان.
(٢) خواردەمەنی؛ ئازووقە. (٣) [T-] ، Tommy Atkins

**Tommy Atkins,** سەربازی ئینگلیز

**Tommy gun,** گوللەپرژێن؛ شەست تیر؛ ڕەشاش.

**tommyrot** (tom′i-rot′), *n.* [Slang]. قسەی قۆڕو بێ مانا؛ قسەی هیچ‌وپووچ؛ گەوجێتی؛ کەرێتی.

**tomography** (tə-mog′rə-fi), *n.* وێنەگرتنی چین، توێ، یا برگەیەك بە تیشکی ئێکس.

**tomorrow** (tə-mor′ō, too-môr′ō), *n.* سبەینێ؛ بەیانی.
*n.* (١) سبەینێ؛ بەیانی. (٢) دوابۆژێکی نزیك؛ دواڕۆژ.

**tompion** (tom′pi-ən), *n.* = **tampion.**

**tomtit** (tom′tit′), *n.* [British], (١) **titmouse** . (٢) فیرنەگولە.

**tom-tom** (tom′tom′), *n.* (١) تەپڵ: جۆرە تەپڵێکی ئەفەریقاییە.
(٢) **tam-tam** (٣) دەنگێکی یەك نەوایی وەك دەنگی تەپڵ.
*v.i.* تەپڵ لێدان

**-tomy** (tə-mi), پاشگرێکە بەمانای: بڕین (نەشتەرگەری)؛ لە ڕیشە دەرهێنان: *( appendectomy)* .

**ton** (tun), *n.* (١) تەن: (ا) لە ئینگلتەرەدا بریتییە لە (٢٤٠٢) پاوەند (ب) لە ئەمەریکا بریتییە لە (٢٠٠٠) پاوەند. (ج) تەنی مەتری: هەزار کیلۆ.
(٢) زۆر: هەندێکی ئێجگار زۆر: *( He has ~s of money.)* .

**ton** (tōn), *n.* مۆدە؛ باو

**tonal** (tō′n'l), *adj.* ئاوازی: هی ئاواز؛ تایبەتی بە ئاواز.

**-tonally** *(adv.).*

**tonality** (tō-nal′ə-ti), *adj.* (١) چۆنێتی ئاواز.
(٢) چۆنێتی ڕێکخستنی ڕەنگەکانی تابلۆیەك.

**tone** (tōn), *n.* (١) (ا) ئاواز؛ دەنگ (مۆسیقا، مرۆڤ).
(ب) چۆنێتی ئەم دەنگە.
(٢) بەرزی و نزمی دەنگی مرۆڤ کە هەستی دەردەبڕێ؛ شێوەی ووتن؛ دەمودوو *( a ~ of contempt)* .
(٣) شێوازی نووسین و ئاخاوتن کە هەڵوێستی کەسەکە دەردەخات:
*( The letter had a friendly ~ .)*
(٤) جیری؛ نەرمی: *( This wood has lost its ~ .)* .
(٥) (ا) شێواز یا خوو نەریتی باوی چەرخێك.
(ب) شێوازی شۆخ و جوان.
(٦) (ا) ڕەنگ؛ ڕەنگی کاڵ.
(ب) پلەی تۆخ و کاڵی ڕەنگ: *( It has three ~s of green.)*
(٧) ئەنجامی شێوەی بەکارهێنانی ڕووناکی و تاریکی ڕەنگ لە تابلۆیەکدا.
(٨) (ا) دەنگی مرۆڤ (ب) بەرزو نزمی ئەم دەنگە
(ج) هێزی سەر برگەو ووشە؛ گرتن (دەنگناسی)
(٩) تەندرووستی (ئەندام، لەش، گیانەوەر).

*v.t.* (١) [Rare] ، بە یەك نەوایی ووتن.
(٢) بە شێواز یا ڕەنگێکی تایبەتی کردن (تابلۆ)؛ دەنگی تایبەتی لێوەهێنان (ئامێری مۆسیقا). (٣) شێوەی ڕەنگ یا دەنگ گۆڕین.

*v.i.* (١) شێوازێکی تایبەتی وەرگرتن (تابلۆ)؛ ڕەنگێکی تایبەتی هەبوون.
(٢) گونجانی ڕەنگ

**tone down,** (١) لە توندوتیژی کەم کردنەوە؛ هێمن کردنەوە؛ ڕەنگ کەم یا کاڵ کردنەوە:
*( He toned down his criticism of the government.)*
(٢) هێمن بوونەوە؛ توندوتیژی کەم بوونەوە.

**tone up,** (١) بەهێزکردن؛ توندکردنەوە؛ گورج کردنەوە:
*( Exercise tones up the muscles.)*
(٢) بەهێزبوون: توندبوون؛ کرژبوون.

**tone arm,** دەسکی دەرزی سنووقی قەوان لێدان.

**tone color,** = **timbre.**

**tone-deaf** (tōn′def′), *adj.* گوێی لە بەرزی و نزمی ئاوازی مۆسیقا نییە.

**toneless** (tōn′lis), *adj.* (١) یەك نەوا؛ بێ بەرزی و نزمی.
(٢) سست؛ بێ تین؛ خاو.

**tone poem,** = **symphonic poem.**

**tong** (tôŋ, toŋ), *v.t.* بە مقاش دەستکاری کردن، تێکدان، یا هەڵگرتن.
*v.i.* مقاش بەکارهێنان

**tong** (tôŋ, toŋ), *n.* (١) حیزب یا ڕێکخراوێکی چینی.
(٢) ڕێکخراوێکی چینی لە ئەمەریکا.

**tonga** (toŋ′gə), *n.* گالیسکەیەکی دوو پێچکەیی سووکی هیندییە

**tongs** (tôŋz, toŋz), *n.pl.* مقاش.

**tongue** (tuŋ), *n.* (١) زمان؛ زبان
(٢) زمانی گیانەوەر (بەتایبەتی ڕەشەووڵاخ بۆ خواردن) (٣) زمان (ئاخاوتن).
(٤) ئاخاوتن؛ گفتوگۆ. (٥) توانای گفتوگۆ یا قسەکردن.
(٦) دەمودوو؛ شێوەی قسەکردن (٧) لوورەی سەگ.
(٨) زمانە: (ا) زمانەی پێڵاو. (ب) زمانەی زەنگ. (ج) زمانەی ئەبزیم
(د) مژان (گالیسکە) (هـ) زمانە (دارتاشی) (و) زمانەی تەرازوو.
(ز) پارچە زەوییەکی درێژکۆلەیە کە درێژبووبێتەوە ناو دەریا.

*v.t.* (١) سەرزەنشت کردن؛ شکاندن. (٢) [Archaic] ، ووتن؛ دەربڕین.
(٣) زمان لێوەدان؛ زمان تێوەدان (٤) (ا) زمانە بۆ کردن؛ لەلە کردن
(ب) بە زمانەو کون لێکدان (دارتاشی)

*v.i.* (١) [Rare] . قسەکردن؛ زۆروێژی کردن. (٢) سەر دەرهێنان وەك زمان

**give tongue,** دەست بە وەڕین کردن (تانجی)؛ وەڕین

**hold one's tongue,** زمانی خۆ گرتن؛ قڕوقەپ کردن

**on everybody's tongue.** لەسەر زمانی هەمووکەسێکە؛ هەمووکەس باسی دەکات

**on the tip of one's ( or the ) tongue,** لەسەر زمانێتی؛ لەسەر زمان بوون

**tongue and groove,** زمانەو کون (دارتاشی)؛ نێرەو مێیە.

**tongued** (tuŋd), *adj.* زمانێکی تایبەتی پێوەیە: *( loose- ~ )* .

**tongue-lashing** (tuŋ′lash′iŋ), *n.* [Colloq.], سەرزەنشت؛ سەرزەنشتکردن.

**tongueless** (tuŋ′lis), *adj.* (١) بێ زمان؛ بێ زبان (٢) لاڵ.

**tongue-tied** (tuŋ′tīd′), *adj.* زمان بەستراو؛ زمان گیراو؛ دەم بوو بە تەڵەی تەقیو؛ زمان چووەوە کلیلە.

**tongue twister,** ووشەیەك یا دەستەواژەیەکی بە گران ووتراو (لەبەر چوونیەکی دەنگەکانی).
(بۆ نموونە: **She sells sea shells by the seashore.** )

**tonic** (ton′ik), *adj.* (١) هێزبەخش (دەرمان، خواردەمەنی).
(٢) (ا) تایبەتی بە ئاواز. (ب) هی تۆخی و کاڵی یا پلەی ڕەنگی تابلۆ.

(ج) [Obs.]، تایبەتی بە دەنگی دەنگدەرەوە لە مێشکدا.
(د) هێز لەسەر (دەنگناسی). (٣) کرژ (ماسولکە)؛ جیڕ.
***n.*** (١) دەرمانی هێز؛ دەرمانی هێزبەخش.
(٢) خواردنەوەی گازاوی (دەکرێتە قۆدگاو جنو خواردنەوەی مەستکەری ترەوە). (٣) یەکەم ئاواز.
(٤) (ا) [Obs.]، دەنگ یا تیپی دەنگدەرەوە لە مێشکدا.
(ب) بڕگەی هێز لەسەر یا گیراو (دەنگناسی).

**tonicity** (tō-nis′ə-ti), ***n.*** (١) تەندرووستی
(٢) کرژی ئاسایی ماسولکە؛ جیڕی ماسولکە (هەروەها " **tonus** ").

**tonight** (tə-nīt′, too-nīt′), ***adv. & n.*** ئەمشەو؛ ئیمشەو

**tonnage** (tun′ij), ***n.*** *Also* **tunnage,** (١) باج یا گومرگی لە کەشتی سەنراو بەپێی تەن یا بارەکەی.
(٢) قورسایی ئەو ئاوەی کەشتی بە تەن لای دەبات.
(٣) سەرجەمی تەنی باری نێردراو لە وڵاتێك یا بەندەرێکەوە.
(٤) باری کەشتی بە تەن (٥) قورسایی بە تەن.

**tonneau** (tu-nō′, tə-nō′), ***n.*** کورسی دواوەی جۆرە ئوتومبیلێکی کۆن.

**tonometer** (tō-nom′ə-tēr), ***n.*** تۆنۆمەتر (ا) پێوەری بەرزیو نزمی ئاواز (ب) پێوەری پەستانی هەڵم (ج) پێوەری پەستۆی خوێنو چاو.
**-tonometric** *(adj.)*; **tonometry** *(n.).*

**tonsil** (ton′s'l, ton′sil), ***n.*** ئالوو.

**tonsillectomy** (ton′s'l-ek′tə-mi), ***n.*** ئالوو دەرهێنان (نەشتەرگەری)

**tonsillitis** (ton′s'l-ī′tis, ton′si-lī′tis), ***n.*** ئالوو کەوتن؛ ملەخڕێ.

**tonsillotomy** (ton′s'l-ot′ə-mi, ton′si-lot′ə-mi), ***n.*** ئالوو برین (نەشتەرگەری)؛ ئالوو دەرهێنان

**tonsorial** (ton-sôr′i-əl, ton-sō′ri-əl), ***adj.*** هی سەرتاشو سەرتاشی (لەڕووی گاڵتەوە).

**tonsure** (ton′shēr), ***n.*** (١) سەرتاشینی کەشیش (بەتایبەتی تەپڵی سەری). (٢) سەرتاشران بەم جۆرە. (٣) بەشی تاشراوی سەر بەم جۆرە.
***v.t.*** تەپڵەسەر تاشین

**tontine** (ton′tēn, ton-tēn′), ***n.*** (١) بیمەی هاوبەشی: جۆرە بیمەیەکە چەند کەسێك بەشدار دەبن، کە یەکێکیان مرد بەشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشەکانی هەتا دوا کەس (٢) بەشدارانی ئەم بیمەی هاوبەشییە.
(٣) (ا) سەرجەمی ئەم بیمەیە (ب) بەشی هەریەکە لە بەشدارەکان.

**tonus** (tō′nəs), ***n.*** کرژی ئاسایی ماسولکە؛ جیڕی ماسولکە.

**too** (tōō), ***adv.*** (١) هەروەها؛ – یش؛ – ش: *( He's coming ~ .)*.
(٢) زۆر (لەڕووی خراپییەوە)؛ زیاد لە پێویست؛ لە ئەندازە بەدەر:
*( He ate ~ much. It is ~ cold, hot, loud, etc.)*
(٣) زۆر؛ ئێجگار *( He's only ~ willing to be of service.)*.
(٤) [Colloq.]. نەبێ؛ بێ گومان؛ هەر دەبێ وابێ؛ هەر:
*( You will ~ do it! I will ~ go!)*

**took** (took), *past tense of* **take.**

**tool** (tōōl), ***n.*** (١) ئامێر
*( knives, saws, hammers, and shovels are ~s.)*
(٢) هۆ؛ کەرەسە *( Books are a scholar's ~s.)*.
(٣) دەسکەلا؛ کەسێکی بەکارهێنراو لەلایەن کەسێکی ترەوە بۆ ئامانجی خۆی.
***v.t.*** (١) ئامێر بەکارهێنان؛ چاك کردن یا درووستکردن بە ئامێر.
(٢) ئامێر درووستکردن بۆ کارخانەیەك.
(٣) [British Colloq.]، (ا) ئوتومبیل لێخوڕین؛ لێخوڕین.
(ب) بە ئوتومبیل بردن یا گواستنەوە.
(٤) نەخشەو تیپ هەڵکەندن لەسەر بەرگی کتێب.
***v.i.*** (١) ئامێر بەکارهێنان
(٢) [British Colloq.]، ئوتومبیل لێخوڕین؛ سواری ئوتومبیل بوون.

**toolbox** (tōōl′boks′), ***n.*** سنووقی ئامێر سنووقێکی بچووکە ئامێری دەستی وەك چەکوشو جەربادەرو پلایسی تێ دەخرێت

**tooling** (tōōl′iŋ), ***n.*** ئامێرکاری؛ ئیشی بە ئامێر کراو.

**toolmaker** (tōōl′māk′ēr), ***n.*** ئامێرکار؛ ئامێرساز؛ ئامێر درووستکەر.

**toon** (tōōn), ***n.*** (١) درەختێکی ئوستڕالی گەورەیە دارو تەختەکەی سوورو بۆن خۆشەو گوڵەکەیشی ڕەنگی لێ دەگیرێ. (٢) دارو تەختەی ئەم درەختە

**toot** (tōōt), ***v.i.*** (١) هۆڕنی ئوتومبیل لێدان؛ کەڕەنا لێدان؛ فیکەلێدان.
(٢) دەنگی وەك هۆڕن، کەڕەنا، یا فیکە لێوە هاتن.
***v.t.*** هۆڕن لێدان؛ فوو بە کەڕەنادا کردن؛ فیکەلێدان؛ پەیتا پەیتا هۆڕن لێدان.
***n.*** دەنگی هۆڕن، فیکە، یا کەڕەنا؛ هۆڕن؛ فیکە.
**-tooter** *(n.).*

**toot** (tōōt), ***n.*** [Colloq.], = **spree.**

**tooth** (tōōth), ***n.*** (١) ددان.
(٢) ددانی مشارو زنجیرو کێڕو چنگاڵو پێچکە... هتد.
(٣) ئارەزووی خواردەمەنی؛ چەژ؛ حەز: *( She has a sweet ~ .)*.
(٤) شتی بڕندە یا گازگر.
***v.t.*** (١) دان بۆ کردن (ئامێر). (٢) گرنج گرنج کردنی قەراغی شتێك.
***v.i.*** بەیەکدا چوون (گێر)؛ لێك گیران.
**armed to the teeth,** پڕ چەك.
**fight tooth and nail,** بە هەموو توانایەکەوە شەڕکردن.
**in the teeth of,** بەرەنگار؛ بەرامبەر؛ بەرەو ڕوو.
**put teeth in ( a law ),** خستنەکار (یاسا).
**set one's teeth,** خۆ ئامادەکردن بۆ شتێکی ناخۆشو گران.
**show one's teeth,** ددان لێ جیڕکردنەوە؛ هەڕەشەلێکردن؛ تووڕەیی پیشاندان.

**toothache** (tōōth′āk′), ***n.*** ددان ئێشە.

**toothbrush** (tōōth′brush′), ***n.*** فڵچەی ددان.

**toothed** (tōōtht, tōōthd), ***adj.*** (١) داندار؛ دانی هەیە.
(٢) دانەدار؛ گرنج گرنج.

**-toothed** (tōōtht, tōōthd), پاشگرێکە بەمانای: ژمارەیەك یا جۆرێکی تایبەتی ددانی هەیە: *( big- ~ )*.

**toothless** (tōōth′lis), ***adj.*** بێ ددان.

**tooth paste,** دەرمانی ددان.

**toothpick** (tōōth′pik′), ***n.*** دان ئاژن.

**tooth powder,** بۆدرەی ددان: بۆ ددان شتن بە فڵچە.

**toothsome** (tōōth′səm), ***adj.*** (١) خۆش؛ بەتام.
(٢) چاك: *( a ~ offer)*
(٣) دڵرفێن؛ جوانو پانوپۆڕ.

**toothy** (tōōth′i), ***adj.*** ددان زل؛ ددان دەرپۆقیو.

**tootle** (tōō′t'l), ***v.i.*** هۆڕن لێدان بە ئەسپایی و پەیتا پەیتا؛ فیکەلێدان؛ فوو بە کەڕەنادا کردن
***n.*** هۆڕن؛ فیکە؛ دەنگی هۆڕن یا فیکە؛ هۆڕن یا فیکەلێدان.

**toots** (toots), ***n.*** [Slang], گیانە.

**tootsy** (toot′si), ***n.*** [Slang], (١) پێی منداڵ یا ئافرەت.
(٢) **toots**.

**top** (top), ***n.*** (١) (ا) کاکۆڵ؛ گودلە؛ گێسوو. (ب) قژی سەر.
(٢) تەپڵەسەر؛ سەر.
(٣) لووتکە؛ تەوقەسەر؛ قوتکە؛ کەل؛ سەر: *( the ~ of the hill)*.
(٤) پۆپە؛ پۆپ: *( the tree ~s)*.
(٥) (ا) سەرقاپ؛ قەپاغ؛ سەر. (ب) تەنتە یا سەری ئوتومبیل.
(٦) (ا) ئەوپەڕ؛ بەرزترین پلە، خاڵ، یا شوێن؛ تاف:
*( at the ~ of his voice; the ~ of her career)*
(ب) بەرزترین پلەوپایە: *( He's at the ~ of his profession.)*
(ج) کەسێك کە لە بەرزترین پلەی پیشەیەکدا بێت.
(د) هەڵبژاردە؛ باشترین بەش یا پارچە؛ سەرتوێژ (مەجان):

*( the ~ of the crop)*

(٧) سەرەتا؛ سەر: *( the ~ of the year)* .

(٨) ئەو بەشەی ئاوێتەیەك کە لە هەمووی زیاترو زووتر هەڵدەچێت (کیمیا).

*adj.* بەرزترین: سەروو؛ لاسەروو: *( the ~ drawer, shelf, etc.)* .

*v.t.* (١) (ا) سەر لابردن. (ب) سەر قرتاندن یا هەڵپاچین؛ لق وپۆپ کردن.

(٢) سەر نانەوە: سەر داپۆشین؛ بوون بە سەرقاپ بۆ؛ سەرقاپ بۆ کردن.

(٣) گەیشتنە تەوقەسەرەکەی. (٤) بەسەردا ڕۆیشتن یا تێپەڕبوون.

(٥) زیاتر بوون لە؛ بۆڕ پێدان.

(٦) لەپێش هەموانەوە بوون؛ یەکەم بوون؛ لەسەروو هەموانەوە بوون:

*( He ~ped his class.)*

(٧) لە لاسەرووی تۆپ دان.

*v.i.* (١) دوایی پێ هاتن؛ کۆتایی پێ هێنان. (٢) گەیشتنە تەوقەسەر.

**blow one's top,** [Slang], (١) زۆر تووڕەبوون؛ شێتگیربوون.

(٢) شێت بوون

**on top,** سەرکەوتوو؛ لە سەرەوەیە؛ لە پێشەوەیە.

**on top of,** (١) بە تەوقەسەرەکەیەوە؛ بە پۆپەوە.

(٢) لەسەر دانیشتوو. (٣) سەرەڕای؛ زیاد لە.

(٤) یەکسەر یا کتوپڕ دوای ئەوە.

(٥) [Colloq.]: ئاگای لە هەموو شتێکە؛ مەسەلەکە لەژێر دەستیایەتی؛ شتەکەی فەرامۆش نەکردووە: *( He is on top of the situation.)* .

**over the top,** (١) بەسەر بەردەمی خەنەق یا سەنگەردا (جەنگ).

(٢) لە ئەندازە یا ژمارەی دیاریکراو تێپەڕبوون.

**(the) tops,** [Slang], باشترین؛ بەرزترین؛ نایابترین.

**top off,** دوا شت کردن بۆ تەواوکردن بە ڕێك وپێکی؛ تەواوکردن.

**top** (top), *n.* مزراح.

**topaz** (tō′paz), *n.* (١) تۆپاز: گەوهەری زەرد؛ زەردوویی؛ بەردێکی بەنرخی زەردە. (٢) باڵندەیەکی زۆر بچکۆلەی ڕەنگاوڕەنگی ئەمەریکای باشوورە.

**top billing,** (١) لە سەروو یا لە پێش هەموانەوە (لە بلاونامەی ناوی نوێنەری فیلم و شانۆنامەیەکدا): *( She got ~.)* .

(٢) لە شوێنێکی زۆر لەبەرچاودا (لە ڕۆژنامەدا... هتد).

**top boot,** جزمە

**topcoat** (top′kōt′), *n.* پالتۆی تەنك.

**top dog,** [Colloq.], بەدەسەلاتترین کەسی ڕێکخراوێك یا دەزگایەك؛ دەستبالاترین.

**top-drawer** (top′drôr′), *adj.* بەرزترین (پلەوپایە، چینی کۆمەل)؛ یەکەمین.

**top-dress** (top′dres′), *v.t.* پەینڕێژ کردن؛ پەین تێکردن؛ چەوڕێژ کردن.

**top-dressing** (top′dres′iŋ), *n.* (١) شتی کراو بە زەوی یا ڕێگەوە (پەین، چەو... هتد). (٢) پەینڕێژ؛ چەوڕێژ.

**tope** (tōp), *v.t. & v.i.* [Archaic], عەرەق زۆر خواردنەوە.

**tope** (tōp), *n.* پەرستگای بوودی گوومەز ئاسایی.

**tope** (tōp), *n.* جۆرە کۆسەیەکی بچووکە.

**topee** (tō-pē′, tō′pē), *n.* *Also* **topi,** کلاوێکی هیندییە بۆ بەرهەتاو

**toper** (tōp′ēr), *n.* سەرخۆش: کەسێکی هەمیشە سەرمەست.

**top-flight** (top′flīt′), *adj.* [Colloq.], یەکەم؛ باشترین؛ چاکترین؛ نایابترین

**top-full, topful** (top′fəl′), *adj.* لیپاولیپ؛ لێوان لێو.

**top-gallant** (tə-gal′ənt, top′gal′ənt), *adj.* (١) لە لاسەرووی ستوونی بەلەم و کەشتی بایەوانیدا.

(٢) بەرزترە لە دەوروپشتەکەی (شوورەی کەشتی).

*n.* (١) ستوونی بەرزی بەلەم و کەشتی بایەوان.

(٢) [Rare]، لووتکە؛ تەوقەسەر؛ تاف.

**top hat,** شەپقەی ڕەشی لوولەکی درێژی ئاوریشم.

**top-heavy** (top′hev′i), *adj.* (١) سەر قورس؛ بە ئاسانی دەکەوێ؛ سەرەکەی قورسترە لە لاخوارووەکەی. (٢) لە ئەندازە بەدەر پارەکەی خستۆتە کار (کۆمپانیا).

**top-hole** (top′hōl′), *adj.* [British Slang], نمرە یەك؛ نایاب؛ زۆر چاك.

**tophus** (tō′fəs), *n.* (١) بەڵغی کانزایی بە جومگەی کەسێکەوە کە نەخۆشی جومگەی هەبێت. (هەروەها " chalk-stone ") .

(٢) بەڵغی کانزایی بە ددانەوە.

**topiary** (tō′pi-er′i), *adj.* تایبەتی بە هەڵپاچینی دارودرەخت و شێوەی جوان لێ دروستکردنی.

*n.* (١) هەڵپاچینی دارودرەخت و شێوەی جوان لێ دروستکردنی.

(٢) باخچەیەکی وەها لێکراو.

**topic** (top′ik), *n.* (١) باس (ووتار، بەند، نامیلکە). (٢) باس (گفتوگۆ).

(٣) سەرباس؛ سەرووتار.

**topical** (top′i-k′l), *adj.* (١) ناوچەیی؛ تایبەتی بە ناوچەیەك.

(٢) سەرباسی؛ سەرووتاری.

(٣) پەیوەندی هەیە بە ڕووداو و هەواڵی ئەو کات و چەرخەوە:

*( There are a lot of ~ allusions in his novels.)*

(٤) هی جێیەکی تایبەتی لەش: *( a ~ remedy)* .

**top-knot** (top′not′), *n.* (١) شریتی گرێدراو یا پەڕی لەسەر کراو وەك سەرپێچ. (٢) تۆپەڵە تووکی تەپڵی سەر (وەك هی کەڵەشێر).

**topless** (top′lis), *adj.* (١) بێ سەرقاپ؛ بێ سەر؛ سەر بەتاڵ.

(٢) [Archaic]، زۆر بەرز؛ سەرەکەی بە چاو نابینرێ لەبەر بەرزی.

(٣) (ا) مەمك بەدەرەوە؛ مەمك ڕووت؛ سنگ ڕووت: *( a ~ dancer)*

(ب) سەماکەری مەمك ڕووت سەمای تێدا دەکات: *( a ~ bar)* .

**toplevel** (top′lev′l), *adj.* بەرزترین (پلە، دەسەلات)؛ زۆر بەرز: *( a ~ official)*

**toplofty** (top′lôf′ti), *adj.* [Colloq.], بەفیز؛ ترزل؛ لەخۆبایی؛ بە کەش وفش.

-toploftiness *(n.)*.

**topmast** (top′məst, top′mast′, top′mäst′), *n.* دارکەشتی یا ستوونی ناوەڕاست.

**top minnow,** چەند جۆرە ماسییەکی بچووکن نزیکی ڕووی ئاو دەژین و خواردن دەخۆن هەندێکیان لەباتی گەرا دانان بەچکە دەکەن.

**topmost** (top′mōst′, top′məst), *adj.* بەرزترین؛ بڵندترین؛ لە هەموو بەرزتر.

**top-notch** (top′noch′), *adj.* [Colloq.], نمرە یەك؛ زۆر چاك؛ نایاب؛ زۆر باش: *( a ~ scientist, job, etc.)* .

-top-notcher *(n.)*.

**topo-** (tə-po′), *Also* **top-** , پێشگرێکە بەمانای: ناوچە؛ شوێن؛ جێ: *( topology)*

**topographer** (tə-pog′rə-fēr, tō-pog′rə-fēr), *n.* (١) زانای بەرزو نزمی ڕووی زەوی؛ ڕووخساری زەوی زان.

(٢) نەخشەکاری ڕووخساری زەوی؛ نەخشە دروستکەری شێوەی زەوی.

**topographic** (top′ə-graf′ik), *adj.* *Also* **topographical,** هی نەخشەی شێوەی زەوی؛ تایبەتی بە ڕووخساری زەوی.

-topographically *(adv.)*.

**topography** (tə-pog′rə-fi, tō-pog′rə-fi), *n.* تۆپۆگرافیا: (ا) باسکردنی شوێنێك بە ووردی و ڕاستی. (ب) ڕووخساری زەوی (بە دەشت و شاخ و گرد و ڕووبار و دۆڵ و پرد و ڕێگاوبان و شارەوە... هتد)؛ شێوەی زەوی؛ بەرزی و نزمی ڕووی زەوی (ج) نەخشەکردنی ڕووخساری زەوی؛ وێنەگرتنی ڕووی زەوی. (د) ڕووپێوی ڕووخساری زەوی.

**topology** (tə-pol′ə-ji), *n.* (١) لێکۆڵینەوەی ڕوخساری زەوی، واتە تۆپۆگرافیای شوێنێك. (٢) شێوەی پێکهاتنی بەشەکانی لەش.

(٣) لێکۆڵینەوەی وێنەی ئەندازەیی کە تایبەخۆکانی ناگۆڕێ بە گۆڕینی شێوەکەی (بیرکاری).

**toponym** (top′ə-nim′), *n.* (١) ناوی جێ؛ ناوی شوێن.
(٢) ناوێکه که سەرچاوەو جێی ژیانی ئاسایی گیانەوەرەکە دەردەخات.
**toponymy** (tə-pon′ə-mi), *n.* (١) (ا) ناوی شوێنەکانی وولاتێك یا ناوچەیەك ب: لێکۆڵینەوەی ئەم ناوانە. (٢) ناوی بەشەکانی لەش.
**-toponymic; toponymical** *(adj.).*
**topper** (top′ēr), *n.* (١) ئامێر یا مرۆڤی سەرقرتێنەر.
(٢) [Slang]، شتێکی چاکتر لە هەموو ئەوانەی پێشتر (نوکتە، پەند).
(٣) **top hat** (٤) پاڵتۆی سووکی ژنانە
**topping** (top′iŋ), *n.* (١) سەر قرتان؛ سەر لێکردنەوە
(٢) کرێم و گوێزو شتی ترە کە دەخرێتە سەر کێك و شیرینی؛ سەرکێك.
*adj.* (١) زۆر بەرز؛ بلند؛ هەڵکەوتوو.
(٢) [British Colloq.]، نمرە یەك؛ زۆر چاك.
**topple** (top′'l), *v.i.* (١) (~ **over**) کەوتن؛ بەلاداهاتن؛ هەڵگەڕانەوە
(٢) لەتردان؛ لاربوونەوە؛ بەم لاو ئەولادا کەوتن؛ شۆڕبوونەوە
*v.t.* خستن؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ ڕووخاندن: *( to ~ the government)* .
**tops** (tops), *adj.* [Slang], نایاب؛ زۆر چاك؛ نمرە یەك.
**topsail** (top′s'l, top′sāl′), *n.* ستوورز یا دارکەشتی ناوەڕاست.
**top-secret** (top′sē′krit), *adj.* زۆر نهێنی
*( a ~ memo, directive, operation, etc.)*
**top sergeant,** [Colloq.], بارچاوەش (سوپا)
**topsoil** (top′soil′), *n.* چینی سەرەوەی خاك.
**topsy-turvy** (top′si-tûr′vi), *adv. & adj.* (١) سەربەرەوخوار؛ سەربەرەوژێر. (٢) شێواو؛ تێکچوو؛ نارێك وپێك؛ تێکەڵاووپێکەڵاو.
*n.* (١) سەربەرەوخواری؛ سەربەرەوژێری.
(٢) شێواوی؛ نارێك وپێکی؛ تێکەڵاووپێکەڵاوی.
**toque** (tōk), *n.* جۆرە شەپقەیەکی ژنانەیە.
**tor** (tôr), *n.* گردی بەرزی بەردین.
**torah, tora** (tō′rə-to′rô), *n.* تەورات: پەرتووکی ئاینی جوولەکەیە.
**torch** (tôrch), *n.* (١) شاپلیتە؛ بلێسە؛ مەشخەڵ
(٢) بلێسە: سەرچاوەی ڕووناکی؛ ڕووناکی: *( the ~ of science)* .
(٣) بلێسەی لەحیمکاری؛ شاپلیتەی لەحیمکاری
(٤) [British]، **flashlight**
**carry a ( or the ) torch for,** [Slang], خۆشویستن؛ حەزلێکردن.
**torchbearer** (tôrch′bâr′ēr), *n.* (١) بلێسە هەڵگر
(٢) ڕێ ڕووناککەرەوە؛ پێشڕەو؛ ڕابەر.
**torchlight** (tôrch′līt′), *n.* بلێسە؛ گڕی مەشخەڵ؛ ڕووناکی مەشخەڵ.
**torchon lace,** جۆرێکە لە نەقشکاری.
**torch singer,** گۆرانی بێژی دڵداری یا خۆشەویستی.
**torch song,** گۆرانی دڵداری (بەتایبەتی کە هەر لە یەك لاوە بێت)
**torchwood** (tôrch′wood′), *n.* (١) درەختێکە دارەکەی دەکرێ بە بلێسە (٢) داری ئەم درەختە.
**tore** (tôr, tōr), *alternative past tense of* **tear.**
**tore** (tôr, tōr), *n.* = **torus.**
**toreador** (tôr′i-ə-dôr′), *n.* ئەسپ سواری شەڕەگاکەری ئیسپانی
**torero** (tô-re′rô), *n.* شەڕەگاکەری ئیسپانی؛ گابازی ئیسپانی.
**tori** (tôr′ī, tō′rī), *plural of* **torus.**
**torment** (tôr′ment, tôr-ment′), *n.* (١) ئامێری ئازاردان.
(٢) چەوسانەوە؛ چەوساندنەوە؛ ئازار؛ ئازاردان.
(٣) سەرچاوەی ئازارو ناخۆشی؛ هۆی ناخۆشی
*v.t.* (١) چەوساندنەوە؛ ئازاردان؛ سوێ کردن بە دڵەوە
(٢) پەست کردن؛ هەراسان کردن؛ تووشی ناخۆشی کردن.
(٣) [Obs.]، وورووژاندن.
**tormentil** (tôr′men-til′), *n.* ڕووەکێکی خشۆکی گوڵ زەردە (ڕەگەکەی بۆ دەرمان و بۆیەو پێستە خۆشکردن بەکاردەهێنرێ).
**tormentor** (tôr-men′tēr), *n. Also* **tormenter,** (١) ئازاردەر؛ چەوسێنەرەوە. (٢) پەردە (شانۆ). (٣) پەردەی دەنگبڕ (فیلم).
**torn** (tôrn, tōrn), *alternative past participle of* **tear.**
**tornado** (tôr-nā′dō), *n.* تۆرنادۆ؛ گەردەلوولی بەهێز؛ گێژەڵووکە یا گێژەبای زۆر قایم
**-tornadic** *(adj.).*
**toroid** (tō′roid), *n.* ڕووی مارپێچی (ئەندازە).
**torose** (tō′rōs, tō-rōs′), *adj.* (١) ئاوساو؛ دەرپۆقیو؛ هەوکردوو.
(٢) لوولەکی و بەین بەین دەرپۆقیو (ڕووەکناسی)؛ لوولەکی و گرێدار.
**torpedo** (tôr-pē′dō), *n.* (١) **electric ray** .
(٢) تۆرپیدۆ: بۆمبایەکی درێژکۆڵەی زل خۆهاوێژە دەدرێ بە کەشتی دوژمندا لە ژێردەریاییو فڕۆکەوە. (٣) مین یا بۆمبای ژێرئاو.
(٤) تەقەمەنییەك یا دەمەرقاچانێکە دەتەقێتەوە کە دەدرێ بە شوێنێکی ڕەقدا
(٥) تەرەقەیەکە دەخرێتە سەر هێڵی ئاسن شەمەندەفەر دەیتەقێنێتەوە بۆ وورریاکردنەوەی دەستەی کارگەرانی شەمەندەفەرەکە.
(٦) تەقەمەنی بەکارهێنراو لە بیری نەوت هەڵکەندندا.
(٧) [Slang]، پیاوکوژ؛ ڕەش کوژ؛ پاسەوانی پیاوکوژ.
*v.t.* (١) تۆرپیدۆ تێگرتن؛ تێك شکاندن یا نوقم کردنی کەشتی بە تۆرپیدۆ.
(٢) تێکدان؛ پووچ کردنەوە: *( He ~ed our plan.)* .
**torpedo boat,** بەلەمی تۆرپیدۆ: بەلەمێکی خێرای بچووکە بۆ هێرش بە بۆمبای تۆرپیدۆ.
**torpedo-boat destroyer,** کەشتی جەنگی تێکشکێنەری بەلەمی تۆرپیدۆ؛ تێکشکێنەر یا وێرانکەری بەلەمی تۆرپیدۆ.
**torpedo bomber,** فڕۆکەی تۆرپیدۆهاوێژ.
(هەروەها " **torpedo plane** ") .
**torpedo tube,** چووپی تۆرپیدۆ: بۆرییەکە بۆمبای تۆرپیدۆی لێوە دەهاوێژرێ.
**torpid** (tôr′pid), *adj.* (١) سڕ (مارو هەندێ گیانەوەری تر بە زستان)؛ جووڵە لێ براو. (٢) سست؛ خاو؛ بێ تین.
**-torpidity** *(n.)*; **torpidly** *(adv.)*; **torpidness** *(n.).*
**torpor** (tôr′pēr), *n.* (١) سڕی؛ جووڵە لێ بڕان؛ کاسی.
(٢) سستی؛ خاوی؛ بێ تینی.
**torporific** (tôr′pə-rif′ik), *adj.* سڕکەر؛ کاسکەر.
**torquate** (tôr′kwāt), *adj.* خاڵ و میلدار (کەو و باڵندەی تر)؛ مل دەورەدراو بە هێڵی ڕەنگاوڕەنگ.
**torque** (tôrk), *n.* (١) ملەوانێکی کانزایی بادراوە (ئەڵمانیو فەرەنسییەکان لە کۆندا وەك ملوانکە لە ملیان دەکرد).
(٢) هێزی بادەر یا خولێنەرەوە (فیزیا).
**torques** (tôr′kwēz), *n.* خاڵ و میل (کەو و گیانەوەری تر)؛ هێڵی پەڕ یا تووکی ڕەنگاوڕەنگی دەوری ملی باڵندەو گیانەوەر.
**torrent** (tôr′ənt, tor′ənt), *n.* (١) خوڕاو؛ ئاوی بەخوڕ؛ لێزماو؛ لێشاو. (٢) لێشاو؛ لافاو (مەجاز).
(٣) لێزمە باران؛ شەستە باران؛ لێزمە؛ ڕەهێڵە.
*adj.* [Rare]. خوڕ؛ بەخوڕ.
**torrential** (tô-ren′shəl, to-ren′shəl), *adj.* (١) لێزمە؛ لێزمەیی؛ ڕەهێڵە: *( ~ rains)* .
(٢) لێشاوی؛ لێزماوی؛ زۆر بەهێزو توندوتیژ؛ بەخوڕ.
(٣) لە ئەنجامی لێزمە بارانەوەیە.
**-torrentially** *(adv.).*
**torrid** (tôr′id, tor′id), *adj.* (١) هەڵقرچاو؛ هەڵپڕووکاو (بە گەرما)؛ ووشك (٢) زۆر گەرم؛ هەڵپڕووکێنەر؛ زۆر بەتین.
(٣) بەجۆش؛ بەسۆز: *( a ~ love affair)* .
**-torridity** *(n.)*; **torridly** *(adv.)*; **torridness** *(n.).*
**torsade** (tôr-sād′), *n.* شریتی بادراوی شەپقە ڕازێنەوە؛ گێزوگوڵنکی شەپقە.
**torsion** (tôr′shən), *n.* (١) (ا) بادان (بەتایبەتی سەری شتێك و بانەدانی

سەرەکەی تری؛ لوولدان؛ پێچدان. (ب) لوول خواردن؛ پێچ خواردن؛ با خواردن.
(٢) خاربوونەوە یا ڕاستبوونەوەی تەل بادراو دوای بەرەڵاکردنی.

-torsional *(adj.)*.

**torsion balance,** پێوەری پرتەی کارەبا (لەڕێی پێچ خواردنی تەلی بچکۆلەوە)

**torso** (tôr'sō), ***n.*** (١) پەیکەری قەدی مرۆڤ بەبێ سەرو باڵ؛ پەیکەری لەشی مرۆڤ لە پشتێنە بەرەو ژوور (بەتایبەتی بەبێ سەرو باڵو بە ڕووتی).
(٢) قەدی مرۆڤ؛ لەشی مرۆڤ لە پشتێنە بەرەو ژوور.
(٣) کاری ناتەواو؛ نیشی بە نیوەچڵی بەجێهێڵراو (پەیکەرتاشی، نووسین).

**tort** (tôrt), ***n.*** زیان لێکەوتنێکی دەستەنقەست یا ڕێکەوت لە ناوبانگو سامانی کەسێک یا لە کەسەکە خۆی کە دەتوانرێ بدرێ بە دادگا.

**torte** (tôrt), ***n.*** جۆرێکە لە کێک.

**torticollis** (tôr'ti-kol'is), ***n.*** مل کێری (نەخۆشی)؛ مل خواری.

**tortile** (tôr't'l, tôr'til), ***adj.*** لوول؛ پێچاوپێچ؛ مارپێچی؛ باخواردوو.

**tortilla** (tôr-tē'yä), ***n.*** تۆرتیا: نانی مەکسیکی.

**tortious** (tôr'shəs), ***adj.*** زیانی؛ تایبەتی بە زیان.
(ووشەی " tort " ببینە).

**tortoise** (tôr'təs), ***n.*** کیسەڵ؛ ڕەقە.

**tortoise beetle,** قالۆنچەی کیسەڵی؛ قالۆنچەیەکە لە کیسەڵ دەچێ.

**tortoise-shell** (tôr'təs-shel'), ***adj.*** (١) لە قەپێلکی کیسەڵ دروستکراو. (٢) ڕەنگەکەی لە هی قەڵفانی پشتی ڕەقە دەچێ.

**tortoise shell,** (١) قەپێلکی کیسەڵ؛ قاوغ یا قەڵفانی کیسەڵ.
(٢) tortoise-shell butterfly.

**tortoise-shell butterfly,** پەپوولەیەکی خاڵ خاڵە ڕەنگی لە هی قەپێلکی کیسەڵ دەچێ.

**tortuosity** (tôr'chōō-os'ə-ti), ***n.*** (١) خوارو خێچی؛ پێچاوپێچی؛ چەوتی. (٢) پێچ.

**tortuous** (tôr'chōō-əs), ***adj.*** (١) خوارو خێچ؛ پێچاوپێچ؛ پێچاوی؛ نارێک. (٢) چەوت؛ فێڵباز؛ فێڵاوی؛ پێچوپەنادار.

-tortuously *(adv.)*; tortuousness *(n.)*.

**torture** (tôr'chēr), ***n.*** (١) چەوسانەوە؛ ئازاردان؛ ئازار چەشتن.
(٢) شێوەی ئازاردان یا چەوسانەوە.
(٣) ئازار؛ ئەشکەنجە؛ ناخۆشی ئێجگار زۆر.
(٤) هۆی ئازار، چەوسانەوە، یا ئەشکەنجە.
(٥) [Rare]، شێوان؛ گۆڕان؛ بادان؛ تێکچوون.

***v.t.*** (١) چەوسانەوە؛ ئازاردان؛ سوێ کردن بە دڵەوە؛ ئەشکەنجەدان.
(٢) شێواندن (مانا)؛ گۆڕین؛ تێکدان.

-torturer *(n.)*.

**torturous** (tôr'chēr-əs), ***adj.*** بە ئازار؛ چەوسێنەرەوە؛ زۆر ناخۆش؛ بە ئەشکەنجە.

-torturously *(adv.)*.

**torus** (tôr'əs, tō'rəs), ***n.*** (١) نەخشی قۆقزی نیوبازنەیی بنی پایە (خانووسازی). (٢) چوکڵە ئێسقانی سەرخڕ (توێکاری)؛ ناوساویەکی قۆقز یا سەرخڕ. (٣) تەختی گوڵ. (٤) ڕووی خڕ (ئەندازە).

**Tory** (tôr'i, tō'ri), ***n.*** (١) (ا) چەتەو تاڵانکەری ئێرلەندی سەدەی حەڤدە. (ب) ئێرلەندی چەکداری پاشایەتی خوازی سەدەی حەڤدە.
(٢) تۆری: ئەندامی حیزبی کۆنەپەرستی ئینگلیزی.
(٣) ئەمەریکی سەر بە ئینگلیز لە کاتی شۆڕشی ڕزگاری ئەمەریکادا.
(٤) [t-]، کۆنەپەرست؛ کەسێکی کۆنەپەرست.

***adj.*** کۆنەپەرست

**Toryism** (tôr'i-iz'm, tō'ri-iz'm), ***n.*** بیرو بڕواو ڕێبازو نەریتی کۆنەپەرستان.

**toss** (tôs, tos), ***v.t.*** (١) خستن بەم دیو و بەو دیودا؛ هێنانو بردن؛ لارەولار پێ کردن؛ ڕاوەشاندن: *( The waves ~ed the boat.)*.
(٢) هاویشتن؛ هەڵدان؛ فڕێدان؛ تووڕدان.
(٣) لەپڕ سەر خستن بە پشتدا یا ڕاتەکاندن؛ لەپڕ سەر کێشانەوە بۆ دواوە: *( The horse ~ed its head.)*
(٤) وورووژاندن؛ ڕاوەشاندن؛ خستنە جموجووڵ.
(٥) دان بە زەویدا؛ فڕێدانە سەر زەوی.
(٦) شێروخەت کردن؛ تەڕو ووشکی کردن.
(٧) تێکهەڵدان (زەڵاتە)؛ تێکەڵاوکردن؛ تێکدان: *( to ~ the salad)*.
(٨) [Colloq.]، باسکردن؛ هێنانو بردن.

***v.i.*** (١) لارەولارکردن بەتوندی؛ بەم دیو و بەو دیودا کەوتن بەتوندی؛ ڕاوەشان.
(٢) تەپاوتل کردن؛ تلانەوە؛ ئەم دیو و ئەو دیو کردن:
*( I ~ed in my sleep all night long.)*
(٣) شێروخەت کردن.

***n.*** (١) ڕاتەکان یا کێشانە دواوەی سەر لەپڕ (ئەسپ، مرۆڤ):
*( a ~ of the head)*
(٢) دووبەختی؛ شێروخەت؛ تەڕو ووشکی.
(٣) ماوەی شت هاویشتن؛ دووری شت هەڵدان یا فڕێدان.

toss down, یەکسەر هەڵقووڕاندن؛ بە یەک قوم هەڵقووڕاندن.

toss off, (١) بە پەلەو لاسەرلایی کردن (نووسین، کار... هتد).
(٢) بە یەک قوم هەڵقووڕاندن.

toss up, شێروخەت کردن؛ تەڕو ووشکی کردن.

**tosspot** (tôs'pot', tos'pot'), ***n.*** عەرەق زۆر خۆرەوە؛ هەمیشە سەرخۆش.

**toss-up** (tôs'up', tos'up'), ***n.*** (١) شێروخەت کردن؛ تەڕو ووشکی کردن. (٢) دووبەختی؛ هاتونەهات.

**tost** (tôst, tost), ***obsolete or poetic past tense and p.p. of*** toss.

**tot** (tot), ***n.*** (١) نەخت؛ تۆز؛ نەختال. (٢) منداڵی بچووک؛ منداڵ.
(٣) [British Dial.]، پێکێکی بچووک (خواردنەوەی مەستکەر).

**tot** (tot), ***v.t.*** [British Colloq.], ( ~ **up** ), کۆکردنەوە (ژمارە)؛ سەرجەم کردن.

**total** (tō't'l), ***adj.*** (١) سەرجەم؛ هەموو.
(٢) تەواو؛ سەرپاک؛ سەراپا: *( a ~ loss)*.

***n.*** هەمووی؛ گشتی؛ سەرجەم

***v.t.*** (١) کۆکردنەوە (ژمارە)؛ گردکردنەوە؛ سەرجەم دۆزینەوە.
(٢) کردنە ئەوەندە؛ سەرجەم ئەوەندە بوون.
(٣) [Slang]، تێکوپێکدان (ئوتومبیل)؛ هەمووی شکاندن یا تێکشکاندن:
*( She ~led her car in the accident.)*

***v.i.*** کردنە ئەوەندە؛ سەرجەم ئەوەندە بوون.

**totalitarian** (tō'al-ə-târ'i-ən), ***adj.*** ڕژێمی یەک حیزبی؛ دیکتاتۆری؛ زۆرداری.

***n.*** دیکتاتۆر؛ دیکتاتۆری خواز؛ زۆردار؛ لایەنگری ڕژێمی یەک حیزبی.

**totalitarianism** (tō'tal-ə-târ'i-ən-iz'm), ***n.*** ڕژێمێکە کە یەک حیزب یا یەک کەس دەست بەسەر هەمووشتێکدا دەگرێ؛ بیروباوەڕی ڕژێمێکی وەها؛ دیکتاتۆرێتی.

**totality** (tō-tal'ə-ti), ***n.*** (١) هەموویی؛ گشتێتی؛ سەرجەمی؛ سەرپاکی. (٢) سەرجەم؛ هەموو؛ گشت

in totality, هەمووی پێکەوە؛ بەگشتی؛ بە تێکڕا.

**totalizator** (tō't'l-ə-zā'tēr), ***n.*** ژمێرەر؛ مەکینەی ژماردن (بەتایبەتی هی پارەی براوەی گرەوی غارغارێنی ئەسپ).

**totalize** (tō't'l-īz'), ***v.t.*** کۆکردنەوە (ژمارە)؛ گردکردنەوە؛ سەرجەم وەرگرتن.

-totalizer *(n.)*.

**totally** (tō't'l-i), ***adv.*** بەتەواوی؛ هەمووی؛ سەرتاپا؛ بە جارێک.

**tote** (tōt), ***v.t.*** [Colloq.], (١) بە کۆڵ هەڵگرتن؛ بە کۆڵ بردن؛ گواستنەوە؛ بە کێش کردن. (٢) تفەنگ لە شان کردن؛ چەک هەڵگرتن.

***n.*** [Colloq.], (١) بە کۆڵ گواستنەوە؛ بە کۆڵ بردن؛ بە کێش کردن.

(٢) بار' كول.

**tote** (tōt), *n.* [Colloq.], = **totalizator.**

**tote bag,** [Colloq.], جانتای دەستی نەختێ گەورە

**totem** (tō′təm), *n.* (١) تۆتەم گیاندارێك یا ڕووەكێك یا شتێكی ترە كە هەر خێڵ‌و هۆزێكی هیندی ئەمەریكایی دەیان كرد بە دروشمی خۆیان، گوایە لە بنچینەدا خزمن. (٢) وێنەی ئەم دروشمە.

(٣) چەند خێڵ یا هۆزێكە كە هەمان دروشمیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبێ.

(٤) دروشمێكی پیرۆز

**-totemic** *(adj.).*

**totemism** (tō′təm-iz'm), *n.* (١) بڕوا بوون بە " تۆتەم " و پەیوەندی خێڵایەتی لەڕێی " تۆتەم " ەوە. (وشەی پێشوو ببینە). (٢) جیاكردنەوەی خێزان‌و خێڵ‌و هۆز بەگوێرەی ئەو " تۆتەم " ەی كە دروشمیانە.

(٣) ژیان‌و ڕژێمێكی كۆمەڵایەتی لەسەر " تۆتەم " دانراو.

**-totemist** *(n.)*; **totemistic** *(adj.).*

**totem pole,** (١) ستوونی تۆتەمی: ستوونێكە هیندییەكانی ئەمەریكا دروشمی " تۆتەم " ی خێڵەكەیان لەسەر هەڵدەكەندو لەبەردەمی ماڵەكانیاندا دایان دەچەقاند. (٢) [Slang]، پلەوپایە؛ بەرزو نزمی پلەوپایە؛ گەورەو بچووكی: *( He is the lowest man on the ~ .)*

**totipalmate** (tō′ti-pal′māt), *adj.* پەنجە تەنراو (وەك مراوی‌و قاز)؛ پەنجەكانی پێی هەموو بە پەردە لێكدراون

*n.* باڵندەی پەنجە تەنراو

**-totipalmation** *(n.).*

**totter** (tot′ēr), *v.i.* (١) (أ) بەم لاو بەولادا كەوتن؛ لارەولاركردن

(ب) نزیكی كەوتن بوون؛ شلۆق بوون؛ نزیكی ڕووخان: *( a ~ing empire)* .

(٢) لەتردان؛ بە لارەولار ڕۆیشتن. (٣) دوودڵی كردن؛ ڕاڕایی كردن.

*n.* لەتر؛ لەتردان

**tottering** (tot′ēr-iŋ), *adj.* (١) (أ) پەڕیووت؛ خەریكە دەڕووخێ: *( a ~ building)*

(ب) لەرزۆك؛ لەتراوی

(٢) شلۆق؛ نزیكی ڕووخانە *( a ~ regime)*

**tottery** (tot′ēr-i), *adj.* شلۆق؛ لەرزۆك.

**toucan** (tōō′kan, too-kän′, tōō′kən), *n.* توكان باڵندەیەكی ڕەنگاوڕەنگی دەنووك زل‌و نوشتاوەی ناوچە گەرمەكانی ئەمەریكایە.

**touch** (tuch), *v.t.* (١) دەست لێدان؛ دەست تێوەدان؛ بە دەست هەست پێ كردن (٢) لێدانی دوو شت لە یەكتر.

(٣) دەست خستنە سەر (نەخۆشێك لەلایەن كەسێكی پیرۆزەوە بۆ چاكبوونەوە).

(٤) بەركەوتن؛ لێكەوتن؛ لێدان

(٥) سنوور لێكدان؛ لێكدان؛ سنوور پێكەوەبوون

(٦) بە ئەسپایی لێدان یا پیاكێشان.

(٧) كارتێكردن؛ لابردن *( Water won't ~ these grease spots.)* .

(٨) نەختێك زیان لێدان: *( Frost ~ed the plants.)* .

(٩) تاقیكردنەوە بە سەنگی محەك (زێڕ و زیو).

(١٠) نیشانەكردنی زێڕو زیوی تاقیكراوە. (١١) ئامێری مۆسیقا لێدان.

(١٢) وێنەكێشان یا دەستكاری كردن (بە فڵچە یا پێنووس).

(١٣) ڕەنگ كردن (١٤) وەستان بۆ ماوەیەك (كەشتی لە بەندەردا).

(١٥) دەستكاری كردن؛ لاقەكردن؛ دەست تێوەدان؛ توخن كەوتن.

(١٦) بە خراپی دەستكاری كردن یا بەكارهێنان؛ زیان پێ گەیاندن.

(١٧) چەشتن؛ دەست تێوەدان *( He didn't ~ his supper.)* .

(١٨) گەیشتن؛ خۆ لێدان

(١٩) شان لە شان دان؛ هاوتایی كردن: *( My cooking can't ~ yours.)* .

(٢٠) لێ سەندن؛ بردن (٢١) ناوبردن؛ باسكردن بەسەرپێیی.

(٢٢) پەیوەندی پێوەبوون؛ كارتێكردن: *( a subject that ~es us all)* .

(٢٣) نەختێك خوو ڕەوشت خراپ كردن

(٢٤) نەختێك مێشك تێكدان یا شێت كردن؛ سەر لێدان: *( ~ed in the head)*

(٢٥) هەست جووڵاندن؛ كارتێكردن؛ دڵ ڕاكێشان.

(٢٦) وروووژاندن؛ پەستكردن؛ زیزكردن.

(٢٧) [Slang]، داوای پارە یا قەرز لێ كردن‌و وەرگرتنی.

(٢٨) بەركەوتن (ئەندازە)؛ لێدان.

*v.i.* (١) دەست خستنە سەر (نەخۆشێك لەلایەن كەسێكی پیرۆزەوە بۆ چاكبوونەوە). (٢) بەركەوتن؛ لێدان؛ لێكەوتن. (٣) بەركەوتن (ئەندازە).

*n.* (١) (أ) دەست تێوەدان؛ دەست لێدان؛ بە ئاستەم دەست پیادان؛ دەست لێدران. (ب) بە ئاستەم فڵچە بەركەوتن (وێنەكێشان).

(٢) هەستی دەست لێدان؛ هەستی بەركەوتن. (٣) هەست.

(٤) (أ) هەستی گۆڕین لە ئەنجامی دەست لێداندا.

(ب) گۆڕینێكی كەم لە تابلۆ، وێنە، یا چیرۆكێكدا.

(٥) (أ) نەختێ؛ تۆزێك؛ تۆسقاڵێك: *( a ~ of salt in the food; a ~ of madness)*

(ب) نەختێك (نەخۆشی)؛ تۆزێك: *( a ~ of fever, the flu, etc.)* .

(٦) (أ) سەنگی محەك. (وشەی " touchstone " ببینە).

(ب) چۆنێتی زێڕ یا زیوی تاقیكراوە.

(ج) دامغە یا نیشانەی لە زێڕو زیو دراو پاش تاقیكردنەوەیان.

(٧) (أ) داوای پارە، قەرز، یا بەخشیش كردن.

(ب) پارە، قەرز، بەخشیشی وەرگیراو بەم جۆرە.

(٨) (أ) شێوەی پیانۆ لێدانی كەسێك: *( a light ~ )* .

(ب) شێوەی لێدرانی پیانۆ: *( a piano with a heavy ~ )* .

**in touch with,** پەیوەندی لەگەڵ بوون؛ ئاگا لێ بوون.

**out of touch with,** پەیوەندی لەگەڵ نەبوون؛ ئاگا لێ نەبوون.

**touch at,** وەستان بۆ نەختێك (كەشتی لە بەندەر، ڕێبوار لە شوێنێكدا).

**touch off,** (١) بە ڕاستی‌و تەواوی دەربڕین. (٢) تەقاندن؛ ئاگردان.

(٣) بەرپاكردن؛ تەقاندنەوە: *( The unfair policy touched off big demonstrations.)*

**touch on ( or upon ),** (١) بەركەوتن؛ لێكەوتن؛ زۆر لێوە نزیك بوونەوە.

(٢) پەیوەندی پێوە بوون.

(٣) ناوبردن؛ ناوهێنان؛ بە سەرپێیی‌یەوە باسكردن.

**touch up,** (١) هەست جووڵاندن (بە دەست لێدان)؛ هاندان؛ بزواندن.

(٢) چاك كردن بە دەستكاری كردن؛ ڕێك‌وپێك كردن (بە بۆیەی تر لێدان): *( to touch up a painting)*

**touch-and-go** (tuch′ən-gō′), *adj.* (١) پەلە؛ بە پەلە؛ لامسەرلایی؛ پەلەپرووزێ. (٢) پڕ لە مەترسی؛ هات‌ونەهات؛ دووبەختی.

**touch and go,** (١) كارێكی پەلە یا لامسەرلایی.

(٢) بارودۆخێكی پڕ لە مەترسی یا دووبەختی.

**touch down,** نیشتنەوە (فڕۆكە، كەشتی هەوایی).

**touchdown** (tuch′doun′), *n.* (١) گۆڵ كردن (فوتبۆلی ئەمەریكی)؛ گۆڵ. (٢) نیشتنەوە (فڕۆكە، كەشتی هەوایی).

(٣) كاتی نیشتنەوە.

**touched** (tucht), *adj.* (١) هەست جووڵاو؛ كارتێكراو.

(٢) سەری لێ داوە؛ شێتۆكە؛ تێكچوو.

**touch football,** فوتبۆلی دەست: یارییەكی فوتبۆلی ئەمەریكی‌یە بە دەست دەكرێ.

**touchhole** (tuch′hōl′), *n.* كونی ئاگردان (چەكی ئاگرین‌و تۆپی كۆن).

**touching** (tuch′iŋ), *adj.* هەست جوڵێن؛ كارتێكەر: *( a ~ story, scene, etc.)*

*n.* (١) دەست لێوەدان؛ دەست لێدان.

(٢) هەستی دەست لێدان؛ هەستی بەركەوتن.

*prep.* [Archaic], دەربارەی؛ لە بابەت؛ لەڕووی؛ سەبارەت بە.

**touch-me-not** (tuch′mi-not′), *n.* چەند جۆرە ڕووەكێكن ئەگەر بە گەیوی دەست لە كەلووی تۆوەكانیان بدرێت دەتەقێنەوە.

**touchstone** (tuch′stōn′), *n.* (١) سەنگی محەك: بەردێكی ڕەشە

زێڕو زیوی پێ تاقی دەکرێتەوە. (٢) تاقیکردنەوە؛ پێوانە.

**touchwood** (tuch′wood′), *n.* پووشوو

**touchy** (tuch′i), *adj.* (١) تووڕەوترۆ؛ تەنگە جیکلانە؛ دل ناسك؛

تۆرینوك (٢) زوو ختووکەی دێت (ئەندامی لەش).

(٣) (ا) پڕ مەترسی؛ هاتونەهات؛ دووبەختی: *(a ~ situation)*.

(ب) ناسك (باس): *(a ~ subject)*.

(٤) زووگرگر

**-touchily** *(adv.)*; **touchiness** *(n.)*.

**tough** (tuf), *adj.* (١) جیڕ؛ پتەو؛ قایم.

(٢) کال‌وکرچ؛ نەبرژاو؛ نەکولاو؛ جیڕ: *(~ meat)*.

(٣) لینج

(٤) تۆکمە؛ بەکێش؛ ئازا؛ بەکار؛ بەجەرگ؛ نەبەرد؛ چاونەترس؛ نەبەرد.

(٥) سەرسەخت؛ کەللەڕەق؛ قیرسیچمە

(٦) (ا) دڕ؛ شەڕانی. (ب) توندوتیژ؛ بە زەبر؛ ڕەق.

(٧) قورس؛ گران؛ سەخت؛ دژوار؛ ناخۆش: *(a ~ job, life, etc.)*.

(٨) سەخت؛ ناخۆش: *(a ~ winter)*.

(٩) توندوتیژ *(a ~ fight)*.

*n.* شەقاوە؛ کەسێکی دڕو شەڕانی؛ شەلاتی.

**-toughly** *(adv.)*; **toughness** *(n.)*.

**toughen** (tuf′′n), *v.t.* پتەوکردن؛ جیڕکردن؛ ڕەق کردن؛

بەجەرگ کردن؛ بەهێزترکردن.

*v.i.* پتەوبوون؛ جیڕبوونەوە؛ ڕەق بوون؛ چاو نەترسان؛ توندوتیژ بوون.

**toughie, toughy** (tuf′i), *n.* (١) کەسێکی دڕ یا شەڕانی

(٢) گیروگرفتێکی سەخت.

**tough-minded** (tuf-mīn′did), *adj.* نەبەرد؛ ئازا؛ دڵی نالەرزێ؛

شوێن خەیاڵ نەکەوتوو.

**-tough-mindedly** *(adv.)*; **tough-mindedness** *(n.)*.

**toupee** (too-pā′, too-pē′), *n.* باروکە؛ قژی دەستکرد؛ کلاوقژ.

**tour** (toor, tōōr), *n.* (١) شەفت (کارگە)؛ نۆرە (کار).

(٢) ماوەی کارکردن لە شوێنێکدا (بەتایبەتی سەربازو ئەفسەر).

(٣) گەشت (بەتایبەتی بە کۆمەڵو سەردان لە شوێنی مێژوویی و خۆش و

ناودار)؛ گەڕان (٤) کۆمەڵە گەشتیاری وەها پێکەوە.

(٥) گەڕانێکی کورت بە شوێنێکدا؛ پیاگەڕان:

*(He gave his guests a ~ of the house.)*

(٦) گەشت یا گەڕانی تیپێکی شانۆگەری (بۆ پێشکەش کردنی شانۆنامە لە

چەند شار یا وڵاتێکدا).

*v.i.* گەشت کردن؛ گەڕان؛ چوون بۆ گەشت.

*v.t.* (١) گەشت کردن؛ پێدا گەڕان.

(٢) تیپی شانۆگەری گەڕاندن بە شاراندا.

**on tour,** لە گەڕانە؛ چووە بۆ گەشت

**touraco** (tōō′rä-kō′), *n. Also* **turaco,** باڵندەیەکی ڕەنگاوڕەنگی

ناوچە گەرمەکانی ئەفەریقایە (لە توخمی پەپووە).

**tourbillion** (toor-bil′yən), *n.* (١) (ا) گێژەلووکە

(ب) گێژاو؛ گەرداو. (٢) فیشەکە شێتەیەکە بە پێچ پێچ دەچێ بە ئاسماندا.

**tour de force** (tōōr′ də fôrs′), [Fr.], کارێکی زیرەکانەو ئازایانە؛

شاکار؛ کارێکی لێهاتووانەو بلیمەتانەو بەتوانایانە.

**touring car,** ئوتومبیلی گەشت؛ ئوتومبیلێکی کۆن باوی سەربەتاڵە

جێی پێنج تا شەش کەسی تێدا دەبێتەوە.

**tourism** (toor′iz′m, tōōr′iz′m), *n.* گەشت‌وگوزار؛ گەشتیاری؛

گەڕان

**tourist** (toor′ist, tōōr′ist), *n.* گەشتیار؛ گەڕیدە؛ گەشتەوەر.

*adj.* (١) گەشتەوەری؛ هی گەشتیار.

(٢) گەشتیاری؛ هەرزان (بلیتی هۆی هاتوچۆ).

**tourist class,** پلەی گەشتەوەری (لە شەمەندەفەرو کەشتی و فڕۆکەدا).

**tourmaline** (toor′mə-lin, toor′mə-lēn′), *n.* تورمالین

بەردێکی نیمچە بەنرخی هەمەڕەنگە.

**tournament** (toor′nə-mənt, tür′nə-mənt), *n.* (١) ڕمبازێنی

ئەسپ سوارانی سەدەی ناوەڕاست؛ ملەملێی ئەسپ سوار بە ڕمەوە.

(٢) پێشبڕکێی وەرزش؛ زنجیرە پێشبڕکێ یا بۆڕبۆڕێنی نێوان وەرزشکاران.

**tourney** (toor′ni, tür′ni), *n.* = **tournament.**

*v.t.* ڕمبازێن کردن؛ بەشداربوون لە پێشبڕکێ یا بۆڕبۆڕێنێکدا.

**tourniquet** (toor′ni-ket′, tür′ni-kā′), *n.* دەماربەست

(بۆ خوێن وەستان)؛ دەماربەند.

**tousle** (tou′z′l), *v.t. Also* **touzle,** قژ بژکردن؛ قژ تێکدان.

*n.* قژی بژو دانەهێنراو؛ قژ تێکچوو.

**tout** (tout), *v.i.* (١) [Colloq.]، بە بێ شەرمانە گەڕان بۆ کڕیار یا

دەنگ لە هەڵبژاردندا.

(٢) [Slang]: (ا) سووسەکردن دەربارەی ئەسپی غارغارێن (بۆ گرەو بردنەوە).

(ب) سووسە فرۆشتن دەربارەی ئەسپی غارغارێن (بۆ گرەو بردنەوە).

*v.t.* (١) [Colloq.]، پیاهەڵدان؛ بە شان‌و باڵدا هەڵدان:

*(He was ~ed as the most brilliant military leader.)*

(٢) [Slang]: (ا) سووسەکردن دەربارەی ئەسپی غارغارێن (بۆ گرەو بردنەوە)

(ب) سووسە فرۆشتن دەربارەی ئەسپی غارغارێن (بۆ گرەو بردنەوە)

*n.* کەسێکە سووسە دەکات‌و دەیفرۆشێ دەربارەی ئەسپی غارغارێن

(بۆ گرەو بردنەوە).

**-touter** *(n.)*.

**tout à fait** (tōō′tå′fe′), [Fr.], بەتەواوی؛ هەمووی.

**tout le monde** (tōō′ lə mōnd′), [Fr.], هەموو کەس؛

هەموو جیهان؛ گشت کەس.

**touzle** (tou′z′l), *n. & v.t.* **tousle.**

**tovarisch** (tō-vär′ish), *n.* هاوڕێ (نازناوی شیوعی).

**tow** (tō), *v.t.* ڕاکێشان (بە زنجیر یا گوریس)؛ ڕاکێشان بە دوای خۆدا:

*(to ~ a damaged ship into port; to ~ a car)*

*n.* (١) ڕاکێشان؛ ڕاکێشران؛ ڕاکێشان بە دوای خۆدا.

(٢) شتی ڕاکێشراو (ئوتومبیل یا کەشتی پەك کەوتوو).

(٣) **towline**.

**in tow,** (١) ڕادەکێشرێت؛ خەریکە ڕادەکێشرێت.

(٢) لە دواوەیە؛ بە دواوەیەتی. (٣) لەژێر ڕکێف یا سەرپەرشتیدایە.

**tow** (tō), *n.* ڕیشاڵی بێ کەڵکی کەتان‌و گوش.

*adj.* هی ئەم جۆرە ڕیشاڵە.

**towage** (tō′ij), *n.* (١) ڕاکێشان؛ ڕاکێشران (٢) کرێی ڕاکێشان.

**toward** (tôrd, tō′ërd), *prep.* (١) بەرەو؛ ڕووەو؛ بەرەو ڕوو.

(٢) بۆ ئەو مەبەستە؛ بەرەو ئەو مەبەستە؛ بەرەو:

*(efforts ~ a peaceful settlement; steps ~ peace)*

(٣) بەرامبەر بە؛ دەربارەی: *(her attitude ~ me)*.

(٤) نزیك (کات)؛ دەمەو: *(They left ~ four o'clock.)*.

(٥) بۆ؛ بە نیازی؛ بە تەمای *(They are saving ~ a new car.)*.

*adj. Also* **towards,** [Archaic or Rare], (١) بهات؛ بەهات؛ باش؛ لەبار.

(٢) ئامادەیە بۆ فێربوون؛ هیوای لێ دەکرێ.

(٣) گوێ ڕایەڵ؛ ملکەچ. (٤) نزیك (ڕوودان)؛ خەریکە ڕوو بدات یا ببێت.

(٥) خەریکە بکرێت.

**towardly** (tôrd′li, tō′ërd-li), *adj.* [Arch. or Rare], (١) بهات؛

بەهات؛ باش؛ لەبار. (٢) گوێ ڕایەڵ؛ ملکەچ؛ دەستەمۆ.

(٣) هیوای فێربوونی لێ دەکرێ.

**-towardliness** *(n.)*.

**towards** (tôrdz, tō′ërdz), *prep.* **toward.**

**towboat** (tō′bōt′), *n.* = **tugboat.**

**towel** (tou′′l, toul), *n.* خاولی.

*v.t.* بە خاولی ووشك کردنەوە

**toweling, towelling** (toul′iŋ, tou′′l-iŋ), *n.* قوماشی خاولی.

**tower** (tou′ẽr), *n.* (١) برج؛ مناره. (٢) قولله؛ قەلا. (٣) کەسێکی بەرز، مەزن، یا بەشکۆ.

*v.i.* بەرزبوونەوە؛ بەرزتربوون لە دەوروپشت؛ بلندبوون.

**tower** (tō′ẽr), *n.* ڕاکێش (مرۆڤ، شت).

**towering** (tou′ēr-iŋ), *adj.* (١) زۆر بەرز؛ بلند. (٢) مەزن؛ دەرکەوتوو؛ لێهاتوو. (٣) توندوتیژ؛ توند؛ ئێجگار زۆر *( a ~ rage)*.

**towery** (tou′ēr-i), *adj.* (١) برج برج؛ برجدار. (٢) زۆر بەرز؛ بلند.

**towhead** (tō′hed′), *n.* (١) سەری سپی؛ سەری سپیکار یا قژکاڵ؛ سەری بژ و دانەهێنراو. (٢) کەسێکی قژ سپی یا کاڵ.

-towheaded *(adj.)*.

**towhee** (tou′hē, tō′hē), *n.* فیسقەگولەی ئەمەریکی.

**tow wit,** واتا

**towline** (tō′līn′), *n.* گوریس یا زنجیری ڕاکێشان.

**town** (toun), *n.* (١) [Dial.]، دێ؛ گوند؛ کوێرەدێ. (٢) شارۆچکە (٣) [Colloq.]، شار. (٤) [British]، دێیەك کە بازاڕی هەبێت (٥) ناوشار؛ ناوبازاڕ *( I'm going into ~ .)* (٦) شار یا شارۆچکەی ناوبراو *( They just got into ~ .)* (٧) دانیشتووانی شار؛ خەڵکی شار.

*adj.* شاری؛ هی شار؛ تایبەتی بە شارۆچکە یا شارێك.

**go to town,** [Slang], (١) بەر بۆ حۆ بەرەڵاکردن؛ بەلەسە بوون؛ پەت پچڕاندن. (٢) زۆر سەرکەوتوو بوون؛ سەرکەوتن. (٣) بە دڵ کوشش کردن یا هەوڵدان؛ خۆ ماندووکردن.

**man about town,** کەسێکی خۆش گوزەرانی بێ ئیش‌وکار کە هەر بە دوای ڕابواردندا دەگەڕێ.

**on the town,** [Slang], خەریکی ڕابواردنە لە ناوشاردا؛ دەگەڕێ بە شوێنی ڕابواردنی ناوشاردا (بەتایبەتی بە شەو).

**paint the town red,** [Slang], خواردنەوەو بەزەورەزم گێڕان

**town car,** ئوتومبیلێکی کەشخەی زلە کورسی دواوەی جیاکراوەتەوە لە هی پێشەوە

**town clerk,** تۆمارنووسی شارەوانی؛ فەرمانبەری تۆمارنامەی شارەوانی.

**town crier,** جاڕچی

**town hall,** فەرمانگەی شارەوانی (کە هۆڵێکی گەورەی تێدایە بۆ کۆبوونەوەی گشتی)

**townhouse** (toun′hous′), *n.* = **town hall.**

**town house,** (١) خانووی ناوشار؛ماڵی ناوشار. (٢) خانوویەکە لە زنجیرە خانوویەك کە دیوارەکانیان پێکەوەیەو زۆربەی جاریش دوو نهۆمن

**townlet** (toun′lit), *n.* شارۆچکەی بچووك.

**town meeting,** (١) کۆبوونەوەی گشت خەڵکی شار. (٢) کۆبوونەوەی دەنگدەرانی شار (بۆ لێکۆڵینەوەی کاروباری شار).

**townsfolk** (tounz′fōk′), *n.* = **townspeople.**

**township** (toun′ship), *n.* (١) شارۆچکە (٢) ناوچەیەکی شارەوانییە وەك " ناحیە " (لە ئەمەریکاو کەنەدا).

**townsman** (tounz′mən), *n.* (١) شاری؛ خەڵکی شار؛ شارستانی؛ دانیشتووی شار (٢) هاوشار

**townspeople** (tounz′pē′p'l), *n.pl.* (١) خەڵکی شار؛ دانیشتووی شارێك (٢) شارنشین؛ شارستانی؛ شارستانییەکان. (هەروەها " **townsfolk** ")

**towrope** (tō′rōp′), *n.* پەت یا گوریسی ڕاکێشان.

**tow truck,** لۆری ئوتومبیل ڕاکێشان (ئوتومبیلی پەککەوتوو)

**tox-** (toks), پێشگرێکە بەمانای: ژەهر *( toxemia)*.

**toxaemia** (tok-sē′mi-ə), *n.* toxemia.

**toxalbumin** (toks′al-bū′min), *n.* ماددەیەکی پرۆتینی ژەهرینە

**toxemia** (tok-sē′mi-ə), *n.* تۆکسیمیا؛ ژەهراوی بوونی خوێن (بەهۆی نەخۆشی ئەندامێکی لەشەوە).

**toxemic** (tok-sē′mik, tok-sem′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە خوێن ژەهراوی بوون (بەهۆی نەخۆشی ئەندامێکی لەشەوە). (٢) خوێن ژەهراوی

**toxic** (tok′sik), *adj.* (١) تایبەتی بە ژەهر؛ ژەهری. (٢) ژەهرین؛ ژەهراوی؛ زەهرین.

**toxicant** (tok′si-kənt), *adj.* ژەهرین؛ ژەهراوی؛ زەهرین.

*n.* ژەهر؛ زەهر.

**toxication** (tok′si-kā′shən), *n.* ژەهراوی کردن؛ ژەهر لێدان؛ ژەهرانخوارد بوون.

**toxicity** (tok-sis′ə-ti), *n.* ژەهرێتی؛ پلەی ژەهرێتی؛ ژەهراوێتی.

**toxico-** (tok′si-kō, tok′si-kə), *Also* toxic-, پێشگرێکە بەمانای: ژەهر: *( toxicogenic)*.

**toxicogenic** (tok′si-kō-jen′ik), *adj.* (١) لە ماددەیەکی ژەهرینەوە پەیدابووە. (٢) ژەهردەردەر؛ ماددەی ژەهرین لێ پەیدابوو.

-toxicogenical *(adj.)*.

**toxicology** (tok′si-kol′ə-ji), *n.* ژەهرناسی؛ زانیاری ژەهرو ژەهراوی بوون‌و چارەکردنی.

-toxicological *(adj.)*.

**toxicologist** (tok′si-kol′ə-jist), *n.* ژەهرناس؛ زانای ژەهر.

**toxicosis** (tok′si-kō′sis), *n.* ژەهراوی بوون؛ ژەهرانخوارد بوون؛ ژەهر لێدان.

**toxin** (tok′sin), *n.* تۆکسین: (ا) ژەهرێکە لە بەکتریای نەخۆشییەوە لە لەشدا پەیدا دەبێت. (ب) ژەهری گیاندار (وەك مار).

**toxin-antitoxin** (tok′sin-an′ti-tok′sin), *n.* ژەهرو دژە ژەهر: دەکرێتە لەشەوە بۆ پاراستنی لە نەخۆشی بەتایبەتی وەناق.

**toxine** (tok′sin, tok′sēn), *n.* = **toxin.**

**toxiphobia** (tok′si-fō′bi-ə), *n.* ترسی ژەهرانخوارد بوون؛ ترسی ژەهر لێدان.

**toxoid** (tok′soid), *n.* تۆکسۆید: ژەهرێکی بێ هێز کراوە بە ماددەی کیمیایی دەکرێتە لەشەوە بۆ پاراستنی لە نەخۆشی.

**toxophilite** (tok-sof′ə-līt′), *n.* تیرەوان؛ تیرهاوێژ؛ تیروکەوانچی؛ تیروکەوانباز.

-toxophilitic *(adj.)*; **toxophily** *(n.)*.

**toxoplasmosis** (tok′sō-plaz-mō′sis), *n.* نەخۆشییەکە تووشی کۆئەندامی هەستە دەماری مرۆڤ (بەتایبەتی منداڵی ساوا)و هەروەها سەگ‌و پشیلەو گیانداری شیردەری تر دەبێت.

**toy** (toi), *n.* (١) (ا) دەستبازی؛ چاوباشقاڵی. (ب) یاری؛ گەمە. (٢) شتێکی هیچ‌وپووچ یا بێ نرخ. (٣) زڕوزنگیانە؛ شتی ڕازێنەرەوەی هەرزانبەها. (٤) بووکەشووشە. (٥) کەسێك، گیانەوەرێك، یا شتێکی بچووك (بەتایبەتی سەگ). (٦) [Obs. or Rare]، سەرپێچ یا سەرپۆشی ژنی سکۆتلەندی.

*adj.* (١) بووکەشووشەیی؛ وەك بووکەشووشە. (٢) هی یاری: *( a ~ gun)*.

*v.i.* ( ~ **with** ), یاری پێ کردن: *( to ~ with someone's feelings, an idea, a piece of food, etc.)*

**toyon** (tō′yən), *n.* دەوەنێکی هەمیشە سەوزی گەڵا بریقەداری گوڵ سپی بەر سوورە.

**toyshop** (toi′shop′), *n.* فرۆشگای بووکەشووشە؛ دووکانی یاری منداڵان.

**trabeated** (trā′bi-ā′tid), *adj.* بە دارو دەستەکی ئاسۆیی کراوە نەك بە تاقی کەوانەیی (سەردەرگا، سەربان)

-trabeation *(n.)*.

**trabecula** (trə-bek′yoo-lə), *n.* دیوار یا پەردە (گیانەوەرناسی. ڕووەکناسی).

**-trabecular** *(adj.)*.

**trace** (trās), *n.* (١) ڕێ؛ ڕێگا؛ ڕێڕەو.
(٢) شوێن پێ؛ جێ پێ؛ شوێنەوار؛ جێ نیشان؛ شوێن.
(٣) ڕێی هاتوچۆ.
(٤) نیشانە؛ جێ نیشانە؛ جێ نیشان؛ پاشماوە: *( The war left its ~s .)* .
(٥) نەخت؛ تۆز؛ نەختاڵ؛ تۆسقاڵ:
*( a ~ of anger, mercy, kindness; a ~ of salt)*
(٦) نیشانەیەک یا هێڵێکی وێنە کێشراو.
(٧) **engram**
(٨) تۆسقاڵێکی ئەوەندە کەم کە ناتوانرێ بپێورێ (کیمیا).

*v.t.* (١) بە ڕێگەیەکدا ڕۆیشتن؛ پێدا ڕۆیشتن.
(٢) (أ) شوێن پێ هەڵگرتن. (ب) سۆراخ کردن؛ بۆ گەڕان؛ شوێن هەڵگرتن.
(٣) شوێن کەوتن تا بنج‌وبناوان (ڕووداوێک یا شتێکی مێژوویی لە ئێستاوە هەتا کۆن). (٤) گەیشتنە بنج‌وبناوانی شتێک بەم شوێن کەوتنە.
(٥) وێنەکێشان بە هێڵ؛ هێڵ کێشان.
(٦) (أ) وێنە دروستکردن؛ نەخشەکێشان.
(ب) بەسەرداچوونەوە لەسەر نەخشە.
(٧) وێنە لەسەر گرتنەوە (بە کاغەزێکی تەنک خستنەسەر نەخشەیەک‌و بە پێنووس بەسەرداچوونەوەی).
(٨) تۆمارکردن بە هێڵی خواروخێچ (پێوەری بوومەلەرزە).

*v.i.* (١) پێدا ڕۆیشتن؛ لەسەر ڕێگایەک ڕۆیشتن
(٢) ( **to** - )، گەڕانەوە بۆ بنج‌وبناوانێکی تایبەتی؛ سەرچاوە هەبوون‌و دۆزرانەوە.

**-traceability** *(n.)*; **traceable** *(adj.)*; **traceableness** *(n.)*.

**trace** (trās), *n.* (١) قایشی ئەسپ بەستن بە گالیسکەوە.
(٢) شیشی پێ گەیاندن (مەکینە).

**kick over the traces,** یاخی بوون؛ بەلەسە بوون؛ پەت پچڕاندن.

**traceless** (trās′lis), *adj.* بێ سەروشوێن؛ شوێنەواری نییە؛ جێ نیشانەی نییە.

**-tracelessly** *(adv.)*; **tracelessness** *(n.)*.

**tracer** (trās′ẽr), *n.* (١) سۆراخکەر؛ فەرمانبەرێکە ئیش‌وکاری بۆ گەڕان‌و دۆزینەوەی شتومەکی ون بووە وەک پۆستە.
(٢) پرسیارنامەیەکە دەربارەی شت یا خەڵکی ون بوو.
(٣) ئامێری نەخشەکێش (پێوەری بوومەلەرزەو لێدانی دڵ).
(٤) **tracer bullet** .
(٥) بۆیەیەک یا ماددەیەکی تیشکدەرەوەیە لە تاقیکردنەوەدا بەکاردەهێنرێ بۆ باش دەرخستنی کردارەکە (کیمیا، گیانەوەرناسی).

**tracer bullet,** گوللەی کلکدار. گوللەیەکە کە تەقێنرا دووکەڵێک یا ڕووناکییەکی بە دواوەیە وەک ئەستێرەی کشاو. (هەروەها " **tracer** ") .

**tracery** (trās′ẽr-i), *n.* نەخش‌و نیگاری بەیەکداچووی سەر پەنجەرەو دەرگا

**trache-** (trā′ki), = **tracheo-** .

**trachea** (trā′ki-ə, trə-kē′ə), *n.* قوڕقوڕاگە؛ بۆری هەناسە؛ بۆری هەوا

**tracheal** (trā′ki-əl, trə-kē′əl), *adj.* قوڕقوڕاگەیی؛ هی بۆری هەناسە یا هەوا.

**tracheitis** (trā′ki-ī′tis), *n.* قوڕقوڕاگە چووزاندنەوە؛ هەوکردنی بۆری هەناسە یا بۆری هەوا.

**tracheo-** (trā′ki-ō, trə-kē′ə), *Also* **trache-**, پێشگرێکە بەمانای قوڕقوڕاگەیی؛ تایبەتی بە بۆری هەوا یا هەناسە *( tracheotomy)* .

**tracheotomy** (trā′ki-ot′ə-mi), *n.* نەشتەرگەری بۆری هەوا

**trachoma** (trə-kō′mə), *n.* تەراخۆما؛ چاوئێشە؛ وەردێنە

**trachomatous** (trə-kom′ə-təs), *adj.* تەراخۆمایەتی؛ چاوئێشەیەتی

**trachyte** (trā′kīt, trak′īt), *n.* بەردێکی ئاگرپڕژێنی زبرە

**-trachytic** *(adj.)*.

**tracing** (trās′iŋ), *n.* (١) شوێن پێ هەڵگرتن؛ شوێن کەوتن؛ دووکەوتن.
(٢) وێنەی لەسەر دەرکراو (بە پەڕەیەک کاغەزی تەنک خستنەسەر نەخشەیەک‌و بەسەرداچوونەوەی).
(٣) نەخشی کێشراو (بە پێوەری بوومەلەرزەو لێدانی دڵ).

**tracing paper,** کاغەزی تەنک بۆ خستنەسەر نەخشەو شتی وەهاو وێنە لەسەر دەکردن.

**track** (trak), *n.* (١) شوێن پێ؛ شوێن تایەی ئۆتومبێل؛ شوێن.
(٢) نیشانە؛ جێ نیشان؛ جێ نیشانە؛ شوێنەوار؛ پاشماوە.
(٣) ڕێ؛ ڕێگەی زۆر بەسەردا هاتوچۆ کراو؛ ڕێڕەو؛ ڕێچکە؛ زەلامەڕێ
(٤) ڕێباز؛ ڕێ؛ ڕێگا. (٥) زنجیرە؛ بەردەوامی.
(٦) مەیدانی پێشبڕکێ (ڕاکردن، غارغارێن... هتد).
(٧) هێڵی شەمەندەفەرو ترام (٨) ماوەی نێوان تایەی بەرامبەری ئۆتومبێل.
(٩) (أ) وەرزشی سەر ڕێڕەو یا مەیدانی دیاریکراو (وەک ڕاکردن‌و بازدان بەسەر کۆسپدا). (ب) ئەم وەرزشەو وەرزشی گۆڕەپان.

*v.t.* (١) (أ) شوێن پێ هەڵگرتن. (ب) شوێن کەوتن؛ دووکەوتن؛ شوێن هەڵگرتن.
(٢) سۆراخ کردن؛ شوێن کەوتن (بەهۆی نیشانەو بەڵگەوە).
(٣) پێدا ڕۆیشتن؛ بە ڕێگەدا ڕۆیشتن؛ گەشت کردن؛ کوتان (ڕێ).
(٤) ( **up** ~ )، شوێن پێ بەجێهێشتن؛ جێ نیشانە بەجێهێشتن.
(٥) لە دوای خۆوە بەجێهێشتن: *( He ~ed dirt over the floor.)*
(٦) هێڵی ئاسن بۆ کردن؛ ڕێی ئاسن بۆ دروستکردن.

*v.i.* (١) بە هەمان ڕێگەدا ڕۆیشتن؛ لەسەر ڕێیەک ڕۆیشتن.
(٢) ڕێکبوون (ڕەوڕەوە، چەرخ، گێڕ).
(٣) ئەوەندە دووربوون لە یەکترییەوە (ڕەوڕەوەی بەرامبەری ئۆتومبێل)

*adj.* (١) هی هێڵی شەمەندەفەر. (٢) لەسەر ڕێڕەو یا مەیدانێکی دیاریکراو دەکرێت (یاری وەک ڕاکردن‌و بازدان بەسەر کۆسپدا).

**-trackable** *(adj.)*; **tracker** *(n.)*.

**in one's tracks,** لە شوێنی خۆیدا:
*( He was stopped in his tracks.)*

**cover up one's tracks,** بەڵگەی تاوانکاری لە دوای خۆوە بەجێ نەهێشتن؛ شوێنەونی کردن

**keep track of,** ئاگا لێ بوون؛ فەرامۆش نەکردن؛ حساب ڕاگرتن؛ ون نەکردن.

**lose track of,** ئاگا لێ نەمان؛ فەرامۆش کردن؛ حساب ڕانەگرتن؛ ون کردن؛ بۆ نەژمێردران

**make tracks,** [Colloq.], بە پەلە ڕۆیشتن.

**off the track,** لە باس لادان؛ لە مەبەست لادان.

**on the track,** لە باس لانەدان.

**track down,** (١) شوێن پێ هەڵگرتن‌و دۆزینەوە؛ شوێن هەڵگرتن‌و گرتن؛ دووکەوتن: *( to track down a criminal)* .
(٢) بۆ گەڕان‌و دۆزینەوە؛ بە دوادا گەڕان؛ شوێن کەوتن هەتا سەرچاوەکەی‌و دۆزینەوەی.

**trackage** (trak′ij), *n.* (١) گشت هێڵی شەمەندەفەری کۆمپانیایەک
(٢) بەکارهێنانی هێڵی شەمەندەفەری کۆمپانیایەک لەلایەن شەمەندەفەری کۆمپانیایەکی ترەوە (٣) کرێ یا مزی ئەم بەکارهێنانە.

**track and field,** یاری گۆڕەپان‌و مەیدان؛ وەرزشی سەر ڕێڕەو و مەیدانی دیاریکراو (وەک ڕاکردن‌و بازدان بەسەر کۆسپدا).
(هەروەها پێی دەوترێ: " **track** ") .

**trackless** (trak′lis), *adj.* (١) لەسەر هێڵی ئاسن یا هێڵی دیاریکراو ناڕوات: *( a ~ trolley)* .
(٢) ڕێگەی پێدا ناڕوات؛ شوێن پێ یا جێ نیشانەی هیچ تێدا نییە

**trackless trolley,** = trolleybus.

**trackman** (trak′mən), *n.* = **trackwalker.**

**track man,** وەرزشکاری بەشدار لە ڕاکردن‌و بازدان بەسەر کۆسپدا.

**track meet,** پێشبڕکێی ڕاکردن‌و بازدان بەسەر کۆسپداو وەرزشی

گۆڕەپان

**track record,** ڕابوردوو و بەرهەمی کەسێك، کۆمپانیایەك: ڕێکخراوێك، یا دەزگایەك... هتد (باش بێ یا خراپ).

**trackwalker** (trak′wô′kẽr), ***n.*** پشکنباری هێڵی شەمەندەفەر

**tract** (trakt), ***n.*** (١) ماوە: کات: سات: چەرخ (٢) پەلەزەوی: پارچە زەوی (٣) بۆری ناولەش: ***( the urinary ~ )*** . (٤) گۆرانی ئاینی (ئاینی کاسۆلیکی)

**tract** (trakt), ***n.*** نامیلکە (بەتایبەتی هی پروپاگەندەی ئاینی یا رامیاری).

**tractable** (trak′tə-b'l), ***adj.*** (١) بە ئاسانی دابین دەکرێ: ملدەر: ملکەچ: گوێ ڕایەڵ. (٢) نەرم (کانزا): چەکوشخۆر: چۆن بوویستری وای لێ دەکرێ

**-tractability; tractableness *(n.)*; tractably *(adv.)*.**

**tractate** (trak′tāt), ***n.*** نامیلکە: لێکۆڵینەوە: ووتار

**tractile** (trak′t'l, trak′til), ***adj.*** دەکشێنرێت (کانزا): دەکشێت.

**traction** (trak′shən), ***n.*** (١) ا) ڕاکێشان (بەسەر ڕێگا یا ڕێگای ئاسندا) ب) ڕاکێشران (٢) ماسولکە ڕاکێشان (بۆ ئیسقان گرتنەوە یا هێنانەوە جێی خۆی). (٣) هێزی ڕاکێشانی مەکینە ***( steam ~ )*** . (٤) پێوەنووسان لەکاتی لێخشاندندا (وەك تایەی ئوتومبیل بە ڕێگاوە یا ڕەوڕەوەی شەمەندەفەر بە هێڵی ئاسنەوە).

***( old tires don't have much ~ on wet roads.)***

**tractive** (trak′tiv), ***adj.*** ڕاکێش: هی ڕاکێشان: لە ڕاکێشاندا بەکاردەهێنرێ.

**tractor** (trak′tẽr), ***n.*** (١) تراکتۆر (٢) لۆرییەکی بێ لەشە بۆ شت ڕاکێشان. (٣) فرۆکەیەکە پەروانەکانی لە پێش باڵەکانییەوەیەتی. (هەروەها " **tractor airplane** ").

**trade** (trād), ***n.*** (١) (ا) ڕێ: ڕێگە (ب) ڕێباز (٢) پیشە (٣) بازرگانی: ئاڵوویر: کڕین و فرۆشتن: گۆڕینەوە. (٤) خەڵکی هاوپیشە: کەسانی هاوکارو کاسبی (٥) کڕیاران: کڕیار. (٦) سەوداگەری (٧) گۆڕینەوە (٨) *(pl.)*، بای بازرگانی.
***v.i.*** (١) پیشەوەرییەك یا بازرگانییەك گرتنە دەست (٢) بازرگانی لەگەڵ کردن. (٣) گۆڕینەوە: ئاڵوگۆڕکردن. (٤) [Colloq.]، ێ کڕین: کڕیاری فرۆشگایەك.
***v.t.*** گۆڕینەوە: ئاڵوویرکردن.

**trade in,** گۆڕینەوەی شتی کۆن بە هی تازە و جیاوازی نرخەکە دان (بەتایبەتی ئوتومبیل): ***( I traded in my old car for a new one.)*** .

**trade on ( or upon ),** بەکارهێنان بۆ سوودی خۆ.

**trade book,** کتێبی بازرگانی: کتێبێکە چاپ دەکرێ و دەفرۆشرێ بە گشت خەڵك نەك بە قوتابخانە.

**trade-in** (trād′in′), ***n.*** (١) شتێکە ئاڵوگۆڕ دەکرێ لەگەڵ یەکێکی تازەتردا و جیاوازی نرخەکەیان دەدرێ (ئوتومبیل، سەهۆڵدان... هتد). (٢) ئاڵوگۆڕێکی وەها.

**trade journal,** گۆڤاری پیشەیی

**trade-mark** (trād′märk′), ***n.*** نیشانەی بازرگانی: نیشانە یا تامغەی دەزگایەکی بازرگانی تایبەتی
***v.t.*** (١) ئەم نیشانەیە یا تامغەیە خستنە سەر فرۆتەنی (٢) تۆمارکردنی ئەم نیشانە بازرگانییە لە دەزگای تایبەتی میری.

**trade name,** (١) ناوی بازرگانی فرۆتەنییەك. (٢) ناوێکە وەك نیشانەی بازرگانی بەکاردەهێنرێ. (٣) ناوی بازرگانی کۆمپانیایەك یا دەزگایەك

**trade-off** (trād′ôf′), ***n.*** ئاڵوگۆڕ (بەتایبەتی ئاڵوگۆڕکردنی شتێکی پێویست یا باش بە یەکێکی پێویستر یا باشتر)

**trader** (trād′ẽr), ***n.*** (١) بازرگان (٢) کەشتی بازرگانی (٣) کەسێکە کە زوو زوو بەشی بۆرسە یا پارەبازی دەکڕێت و دەفرۆشێتەوە (بۆ خۆی نەك وەك دەلاڵ)

**trade route,** ڕێی بازرگانی (کەشتی و کاروان... هتد).

**tradescantia** (trad′es-kan′shi-ə), ***n.*** جۆرە ڕووەکێکی گوڵ ڕەنگاوڕەنگە.

**trade school,** قوتابخانەی پیشەیی.

**tradesman** (trādz′mən), ***n.*** (١) پیشەوەر: پیشەساز: پیشەگەر. (٢) دوکاندار: فرۆشگاچی: بازرگان: کاسب.

**tradespeople** (trādz′pē′p'l), ***n.pl.*** دوکانداران: فرۆشگاچییان: بازرگانان.

**trades union,** [British], = **trade union.**

**tradeswoman** (trādz′woom′ən), ***n.*** دوکانداری ژن: ژنە دوکاندار.

**trade-union** (trād′ūn′yən), ***adj.*** هی یەکێتی کرێکاران
***n.*** یەکێتی کرێکاران.

**trade union,** یەکێتی کرێکاران.

**trade unionist,** (١) ئەندامی یەکێتی کرێکاران. (٢) لایەنگری یەکێتی کرێکاران.

**-trade unionism.**

**trade wind,** بای بازرگانی.

**trade up,** گۆڕینەوەی شتێکی نەختێك کۆن بە هی تازەترو باشتر (وەك ئوتومبیل).

**trading post,** مەڵبەندی ئاڵوویر: دوکانێکە لە ناوچەیەکی تەریك و کەم ئاوەدانیدا بۆ ئاڵوویرکردن لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا.

**trading stamp,** پووڵی گۆڕینەوە: پووڵێکە بازرگان دەیدات بە کڕیارەکانی و ئەوانیش دەتوانن بیگۆڕنەوە بە فرۆتەنی لە فرۆشگاکانی هەمان بازرگاندا.

**tradition** (trə-dish′ən), ***n.*** (١) ناپاکی: هاوکاری کردن لەگەڵ دوژمندا. (٢) بۆ بەجێهێشتن یا بۆ مانەوەی خوو نەریت و کەلەپووری پشتاوپشت. (٣) نەریتی کۆمەڵایەتی: پاشماوەی دێرین: نەریتی کۆن: خوو نەریتی کۆمەڵایەتی کۆن: پاشماوەی دێرین. (٤) دەستووررو نەریتی کۆنی هونەرو وێژەو شانۆگەری... هتد. (٥) تاپۆی خانوو و زەوی‌وزار خستنە سەر خاوەنە تازەکەی. (٦) (ا) ئامۆژگارییەکانی مووسا. (ب) ئامۆژگارییەکانی عیسا. (ج) ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەر.

**traditional** (trə-dish′ən-'l), ***adj. Also* traditionary,** بەپێی نەریت و دەستووری کۆن: لەسەر خوو نەریتی کۆمەڵایەتی کۆن: کۆنباو.

**traditionalism** (trə-dish′ən-'l-iz'm), ***n.*** (١) زۆر پەیڕەوی کردنی خوو نەریتی کۆمەڵایەتی کۆن (بەتایبەتی لە ئایندا). (٢) بیروباوەڕێکە دەڵێت: کە خوا سەرچاوەی هەموو زانیارییەك و ئاینێکە

**traditionalist** (trə-dish′ən-'l-ist), ***n.*** کەسێکی زۆر پەیڕەوکەری نەریت و دەستووری کۆن.

**traditionally** (trə-dish′ən-'l-i), ***adv.*** بەپێی خوونەریتی کۆن: بەگوێرەی دەستووری کۆمەڵایەتی کۆن: بە ئاسایی: هەر لە کۆنەوە.

**traditionalize** (trə-dish′ən-'l-īz′), ***v.t.*** کردن بە بەشێك لە نەریت و دەستووری کۆمەڵایەتی کۆن.

**traditionary** (trə-dish′ən-er′i), ***adj.*** - **traditional.**

**traditor** (trad′ə-tẽr), ***n.*** خاچ پەرستی ناپاك (کە هاوکاری دەکرد لە کۆندا لەگەڵ ڕۆمانەکان دژی هاوئاینەکانی خۆی).

**traduce** (trə-dōōs′, trə-dūs′), ***v.t.*** لەکەدارکردن: ناو پیس کردن: ناو زڕاندن: ئابڕووبردن: بوختان بۆ کردن.

**-traducement *(n.)*; traducer *(n.)*.**

**traducianism** (trə-dōō′shən-iz'm, trə-dū′shən-iz'm), ***n.*** بیروباوەڕێکی ئاینییە دەڵێت: کە ئادەمیزاد گیان و لەشی لە دایك و باوکییەوە بۆ هاتووە.

**traffic** (traf′ik), ***n.*** (١) (ا) فرۆتەنی گواستنەوە. (ب) بازرگانی لەگەڵ جێی دووردا. (٢) ئاڵوویر: کڕین و فرۆشتن: بازرگانی.

(٣) قاچاخچێتی. (٤) سەوداگەری.
(٥) (ا) هاتوچۆی ڕێگەوبان (ئوتومبیل، خەڵك... هتد).
(ب) گشت ئوتومبیلو خەڵكو كەشتی... هتد كە بەڕێوەن.
(٦) ڕێبوارو باری گوێزراوە لەلایەن كۆمپانیایەكەوە.
*adj.* هی هاتوچۆ؛ تایبەتی بە هاتوچۆی ڕێگەوبان: ***( a ~ policeman)*** .
*v.t.* (١) ( ~ in ). شت كڕینو فرۆشتن بە قاچاخ؛ قاچاخچێتی كردن.
(٢) ( ~ with ). سەودا لەگەڵ كردن؛ سەوداگەری كردن؛ ئاڵوێر لەگەڵ كردن.
**trafficker** (traf′ik-ēr), ***n.*** بازرگان. ئاڵوێركەر؛ سەوداگەر.
**traffic light,** چرای هاتوچۆی ئوتومبیل لەسەر شەقامەكان.
**traffic signal,** = **traffic light.**
**tragacanth** (trag′ə-kanth′), ***n.*** (١) كەتیرە.
(٢) بنچك یا ڕووەكی كەتیرە.
**tragedian** (trə-jē′di-ən), ***n.*** (١) نووسەری شانۆنامەی خەماوی؛ نووسەری شانۆگەری كارەساتی یا تراجیدی.
(٢) نوێنەری شانۆنامەی خەماوی یا كارەساتی.
**tragedienne** (trə-jē′di-en′), ***n.*** نوێنەری ژنی شانۆگەری خەماوی یا كارەساتی
**tragedy** (traj′ə-di), ***n.*** (١) شانۆنامەی خەماوی؛ شانۆگەری كارەساتی یا تراجیدی؛ تراجیدیا. (٢) شانۆنامەی خەماوی بەگشتی.
(٣) چیرۆكی خەماوی یا كارەساتی.
(٤) كارەسات؛ كارەهات؛ وەی؛ ڕووداوی زۆر ناخۆش یا جەرگبڕ.
**tragic** (traj′ik), ***adj. Also*** **tragical,** (١) هی شانۆنامەی خەماوی؛ وەك یا تایبەتی بە شانۆگەری كارەساتی.
(٢) نووسەری چیرۆكی خەفەتاوی؛ لە شانۆگەری كارەساتیدا خۆنووێن:
***( a ~ poet)***
(٣) بۆ شانۆگەری كارەساتی شیاو: ***( a ~ voice)*** .
(٤) كارەساتی: خەفەتاوی؛ زۆر ناخۆش؛ ڕەش:
***( a ~ accident, day, etc.)***
**-tragically** ***(adv.).***
**tragic flaw,** خەوشی كارەساتی: كەموكووڕییەكە لە قارەمانی شانۆنامەی خەماویدا كە دەبێتە هۆی كەوتنی.
**tragicomedy** (traj′i-kom′ə-di), ***n.*** تراجیدی كۆمیدی: شانۆنامەی خەماویو پێكەنیناوی.
**tragicomical** (traj′i-kom′i-k'l), ***adj. Also*** **tragicomic,** هی شانۆگەری كارەساتیو گاڵتەجاڕی؛ خەماویو پێكەنیناوی؛ خۆشو ناخۆش.
**-tragicomically** ***(adv.).***
**tragopan** (trag′ə-pan′), ***n.*** قرقاڵی ئاسیایی: باڵندەیەكی ڕەنگاوڕەنگی خاڵ خاڵاوییە ئەوەندەی كەلەشێرێكە.
**tragus** (trā′gəs), ***n.*** چوقڵی كرکراگەی گوێ (كە نزیك كونی گوێچكەیە).
**trail** (trāl), ***v.t.*** (١) (ا) بە دوای خۆدا ڕاكێشان.
(ب) بە دوای خۆدا هێنان: ***( He ~ed dirt into the house.)*** .
(٢) ڕێگە كردنەوە یا نیشانەكردن؛ ڕێگە نیشانەكردن (بە پێدا ڕۆیشتنی).
(٣) شوێن كەوتن؛ دووكەوتن؛ لەسەر هەمان ڕێ ڕۆیشتن.
(٤) لە دواوە بوون (پێشبڕكێ)؛ دواكەوتن؛ دۆڕاندن؛ بەجێمان.
(٥) ڕاوكردن بە شوێن پێ هەڵگرتن؛ شوێن پێ هەڵگرتن.
*v.i.* (١) لە دواوە شۆڕبوونەوە؛ بە دوادا داكەوتن.
(٢) تەڕ فڕێدان بەسەر زەویدا؛ خشان بەسەر زەویدا.
(٣) بڵاوبوونەوە یا درێژبوونەوە بە نارێكوپێكی.
(٤) لێود هاتنە دەرەوە وەك هێڵێك:
***( Smoke ~ed from the chimney.)***
(٥) خۆ بەكێش كردن؛ بە گران ڕۆیشتن.
(٦) لە دواوە بوون (پێشبڕكێ)؛ دواكەوتن؛ بەجێمان.
(٧) شوێن كەوتنی نێچیر (تانجی، سەگی ڕاو)؛ شوێن پێ هەڵگرتن.
***n.*** (١) پاشكۆ؛ كلك؛ شتی ڕاكێشراو لە دواوە
(٢) شوێن پێ: شوێنەوار؛ بۆنی بەجێماو؛ جێ نیشانە؛ پاشماوە.
(٣) ڕێچكە؛ تووله ڕێ؛ پیادە ڕێ؛ باریكە ڕێ.
**trail blazer,** (١) ڕێچكە (ی تازە) نیشانەكەر.
(٢) ڕێبازی تازە دۆزەرەوە؛ شتی نوێ داهێنەر
**trailer** (trāl′ēr), ***n.*** (١) پاشكۆ (مرۆڤ، گیانەوەر، شت... هتد)؛ كلك؛ دووكەوتوو. (٢) واگۆن یا عەرەبانەیەكە بە ئوتومبیل ڕادەكێشرێ بۆ شت گواستنەوە؛ ترێلە. (٣) ژوورێك یا خانووچكەیەكی ڕەوڕەوەدارە بە ئوتومبیل ڕادەكێشرێ بۆ تێدا ژیان (لە گەشتی دووردا و لە ئاوەدانیشدا)
(٤) دیمەنێكی كورتی فیلمێكە پیشان دەدرێ پێش فیلمەكە خۆی لە جاڕ بۆدانی فیلمەكەدا.
**trailer camp,** = **trailer park.**
**trailer park,** هەوارگەی ترێلە. (ژمارە سێی ووشەی پێشووتر ببینە).
**trailing arbutus,** ڕووەكێكی خشۆكی هەمیشە سەوزی گوڵ پەمەیییە.
**trailing edge,** قەراغی دواوەی فڕۆكە، پەروانە... هتد.
**trailing plant,** ڕووەكی خشۆك؛ ڕووەكی پێدا هەڵگەڕاو.
**trail rope,** گوریس یا پەتی ڕاكێشان.
**train** (trān), ***n.*** (١) (ا) كلك یا دامێنی دواوەی درێژی بە زەمیندا خشاو.
(ب) كلكی درێژی باڵندە: ***( the ~ of a peacock)*** .
(ج) زنجیرە شتی لە دواوە ڕاكێشراو. (د) كلك؛ پاشكۆ.
(٢) دەستوپێوەند؛ ڕیزە بەردەستی پیادە.
(٣) كاروان؛ ئاژەڵو وولاخی ڕێچكە بەستوو.
(٤) ئوتومبیلو وولاخو خەڵكی كەرەسەو تفاق هەڵگری سوپا
(٥) زنجیرە ڕوودان؛ چەند ڕووداوێكی دوای ڕوودانێكی گەورە
***( The war brought famine and disease in its ~ .)***
(٦) زنجیرە: ***( a ~ of thought)*** .
(٧) زنجیرە پارچەی مەكینە: ***( a ~ of gears)*** .
(٨) شەمەندەفەر. (٩) هێڵی باڕووت (بۆ ئاگردانی تەقەمەنی).
*v.t.* (١) [Rare] ، بە دوای خۆدا ڕاكێشان؛ ڕاكێشان.
(٢) پەروەردەكردنی ڕووەك (بە هەڵپاچینو بەستنەوەو هەڵواسین بە شتدا)
(٣) پەروەردەكردن؛ بەخێوكردن.
(٤) فێركردن؛ ڕاهێنان؛ مەشق دادان؛ پەروەردەكردن:
***( Nurses are ~ed in this hospital.)***
(٥) مەشق دادانی گیانەوەر بۆ شتی سەیركردن.
(٦) مەشق دادان (وەرزشكار).
(٧) ( ~ on )، نیشان گرتنەوە.
(٨) [Colloq.]، بە ئاوردەست ڕاهێنان؛ ڕاهێنان بۆ پیسایی كردن لە شوێنی خۆیدا (منداڵ، سەگو پشیلەی ناوماڵ).
*v.i.* مەشق كردن؛ مەشق پێ كردن؛ مەشق دادان.
**-trainable** ***(adj.).***
**trainband** (trān′band′), ***n.*** دەستەی چەك لە شان یا میلیشیای ئینگلیزیو ئەمەریكی سەدەی حەڤدەو هەژدە بۆ پشتگیری كردنی سوپا.
**train-bearer** (trān′bâr′ēr), ***n.*** كلك هەڵگر: بەردەستێكە كلك یا دامێنو كەوای بووكو كەسانی تر هەڵدەگرێ لە ڕێ ڕۆیشتنێكدا.
**trainee** (trān-ē′), ***n.*** مەشق پێ كراو (سەرباز، شاگردی پیشەوەر، گیاندار)؛ مەشق كردوو.
**trainer** (trān′ēr), ***n.*** (١) مەشقدادەر؛ مەشقیار:
(ا) مەشقدادەری گیانەوەر (بۆ سێرك و ڕاهێنانی تر).
(ب) مەشقدادەری وەرزشكار.
(٢) ئامێری مەشق پێ كردن یا ڕاهێنان.
**training** (trān′iŋ), ***n.*** مەشق؛ مەشق كردن؛ مەشق پێ كران.
*adj.* هی مەشقو مەشق كردن.
**training college,** [British], دانشگای مامۆستایان.
**training school,** قوتابخانەی پیشەیی
**trainload** (trān′lōd′), ***n.*** باری شەمەندەفەرێك (ڕێبوار یا شتومەك)؛ پڕ شەمەندەفەرێك

**trainman** (trān′mən), ***n.*** کارگەری شەمەندەفەر.
**trainmaster** (trān′mas′tēr, trān′mäs′tēr), ***n.*** کاربەدەستی هێڵی شەمەندەفەر.
**train oil,** رۆنی نەهەنگ و هەندێ گیانداری ئاویی تر.
**traipse** (trāps), ***v.i.*** [Dial. or Colloq.], بێ هوودە بێوار پیاسەکردن.
**trait** (trāt), ***n.*** (١) [Rare] نیشانە.
(٢) نیشانەی جیاکەرەوە (بەتایبەتی هی کەسێتی یا خوو رەووشت و سروشتی مرۆڤ)؛ تایبەخۆ:
***( The chief ~s in the American character are energy and generosity.)***
**traitor** (trā′tēr), ***n.*** ناپاك بەرامبەر وولات، هاوڕێ، بیروباوەڕی خۆ؛ وولاتفرۆش؛ خاین؛ میللەتفرۆش.
**traitorous** (trā′tēr-əs), ***adj.*** (١) ناپاك (مرۆڤ)؛ بێ وەفا؛ بێ پەیمان.
(٢) ناپاکانە؛ ناپاك (کردەوە): ***( a ~ act)***.
**traitress** (trā′tris), ***n.*** ژنی ناپاك (بەرامبەر وولات... هتد).
**traject** (trə-jekt′), ***v.t.*** ناردن یا هاویشتن بە ئاسماندا.
**trajectory** (trə-jek′tēr-i), ***n.*** (١) ڕێبازی لاری مووشەك، ئەستێرەی کلکدار، یا ئەستێرەی گەڕۆك بە ئاسماندا (٢) هێڵێکی خوارە کە چەند هێڵێکی خواری تر دەبڕێ لە هەمان گۆشەدا (ئەندازە).
**tram** (tram), ***n.*** دەزووی ئاوریشمی ئەستوور.
**tram** (tram), ***n.*** (١) واگۆنی سەربەتاڵی کانگەی خەڵووز (کە لەسەر هێڵی ئاسن دەڕوات) (٢) [British]، (ا) ترام (هەروەها " streetcar ")؛ (ب) tramway (ج) cable car.
***v.t.*** بە ترام گواستنەوە.
**tram** (tram), ***n.*** (١) ئامێری ڕاستکردن یا گونجاندنی پارچەکانی مەکینە (هەروەها " trammel ")؛ (٢) ڕاستکردن؛ گونجان؛ سازان.
**tramcar** (tram′kär′), ***n.*** (١) واگۆنی سەربەتاڵی کانگەی خەڵووز (کە لەسەر هێڵی ئاسن دەڕوات) (٢) [British]؛ streetcar.
**tramline** (tram′līn′), ***n.*** هێڵی ئاسنی ترام.
**trammel** (tram′'l), ***n.*** (١) تۆڕ (ڕاوەماسی)
(٢) پێوەند (بەتایبەتی بۆ ئەسپ فێری ڕۆیشتنی تایبەتی کردن)
(٣) (*pl.*)، کۆت؛ کۆسپ؛ شتی ڕێ لێگر یا بەستەرەوە.
(٤) قولاپێك یا شتێکی وەهایە بۆ کتلی و مەنجەل ڕاگرتن لەسەر ئاگری ئاگردان.
(٥) پرگالی وێنەی هێلکەیی کێشان.
(٦) ئامێری ڕاستکردن یا گونجاندنی پارچەکانی مەکینە (هەروەها " tram ").
***v.t.*** (١) (~ up)، بە تۆڕ گرتن؛ بە داوەوە کردن؛ پێوەکردن
(٢) بەستنەوە؛ پێوەندکردن؛ ڕێ لێگرتن.
**-trammeler; trammeller** ***(n.).***
**tramontane** (trə-mon′tān), ***adj.*** کەوتوتە ئەودیو شاخەوە (بەتایبەتی شاخی " ئالپ ").
***n.*** (١) خەڵکی ئەودیو شاخ (٢) بێگانە؛ ناموٚ؛ ناوەکی.
**tramp** (tramp), ***v.i.*** (١) خۆ بەکێش کردن؛ بە گران ڕۆیشتن؛ تەپەتەپ هاتن لە ڕۆیشتندا (٢) سووڕانەوە بۆ ووردە ئیش و سواڵکردن.
***v.t.*** (١) پێشێل کردن؛ پێپەست کردن؛ پێ پیانان.
(٢) پیادا سووڕانەوە؛ پیادا گەڕان؛ پیادا ڕۆیشتن
***n.*** (١) دەربەدەر؛ لاکەوتە؛ لاکەوتەی کۆڵان؛ سواڵکەر؛ گەڕۆکی بێ لانە و هەژار.
(٢) تەپەتەپی پێ. (٣) گەشتی بە پێ؛ بە پێ ڕۆیشتن.
(٤) کەشتییەکی بارە کە ئیشی ڕێکوپێك یا سەروەری نییە و هەر کاتێکیش بۆی هەڵکەوت کار دەکات. (٥) ئالی بنی پێڵاو (بۆ پاراستنی لە بێلکاریدا).
(٦) [Slang]، قەحبە؛ ئافرەتی سووك
**trample** (tram′p'l), ***v.i.*** بە تەپەتەپ ڕۆیشتن؛ بە توندی پێ دانان؛ خۆ کێش کردن
***v.t.*** فلیقاندنەوە؛ پلیشاندنەوە؛ پێشێل کردن؛ پێپەست کردن؛ خستنە ژێر پێوە؛ پێ پیانان.
***n.*** (١) فلیقانەوە؛ پلیشانەوە؛ پێ پیانان. (٢) دەنگی فلیقانەوە یا پلیشانەوە
**trample on; trample under foot; trample upon,** (١) شێلان؛ پێشێل کردن؛ پلیشاندنەوە؛ پێ پیانان؛ فلیقاندنەوە؛ پێپەست کردن
(٢) زۆر بە توندوتیژی و دڵڕەقانە لەگەڵ جووڵانەوە؛ ماف پێشێل کردن؛ پێپەست کردن.
**trampoline** (tram′pə-lin), ***n.*** ترامپۆلین: (ا) خۆنواندنی تەنافباز.
(ب) جانفاسێکی ئەستووری هەڵواسراوە بۆ هەڵبەزو دابەز لەسەرکردنی تەنافباز.
**tramroad** (tram′rōd′), ***n.*** هێڵی ئاسنی ترامی کانگەی خەڵووز.
**tramway** (tram′wā′), ***n.*** (١) tramroad .
(٢) [British]، ڕێی ترام؛ هێڵی ئاسنی ترام یا پاسی ئاوشار.
**trance** (trans, träns), ***n.*** (١) لە هۆش خۆ چوون (نوواندنی موگناتیسی، فێ)؛ بوورانەوە. (٢) وورِی؛ کاس بوون؛ بێ هۆشی.
(٣) حاڵ لێ هاتن (دەروێش).
(٤) لە هۆش خۆ چوون و گوایە پەیوەندی کردن لەگەڵ مردوودا.
***v.t.*** لە هۆش خۆ بردن؛ بێ هۆش کردن؛ وورکردن.
**tranquil** (traŋ′kwil, tran′kwil), ***adj.*** (١) هێمن؛ بێ دەنگ؛ پڕ ئاسوودە؛ بە ئارام: ***( a ~ rural life)***
(٢) خامۆش؛ کپ؛ کشومات: ***( ~ waters)*** .
**-tranquilly** ***(adv.)***; **tranquilness** ***(n.).***
**tranquilize, tranquillize** (traŋ′kwə-līz′), ***v.t.*** ئارام پێدان: هێمن کردنەوە؛ دامرکاندنەوە؛ خامۆش کردن.
***v.i.*** هێمن بوونەوە؛ دامرکانەوە؛ خامۆش بوون.
**tranquilizer** (traŋ′kwə-līz′ēr), ***n.*** (١) هێمنکەرەوە؛ ئارامدەر.
(٢) دەرمانی هێمنکەرەوە یا ئارامدەر.
**tranquillity, tranquility** (traŋ-kwil′ə-ti), ***n.*** هێمنی؛ ئارامی؛ خامۆشی؛ کشوماتی؛ ئاسوودەیی؛ بێ دەنگی.
**trans-** (trans, tranz), پێشگرێکە بەمانای: (ا) لەو بەرییەوە؛ بۆ ئەوبەر؛ بۆ ئەودیو؛ بەسەریدا (تێپەڕبوون): ***( transatlantic)*** .
(ب) گۆڕین بەتەواوی: ***( transform; transliterate)*** .
**transact** (tran-sakt′, tran-zakt′), ***v.t.*** کاروباری بازرگانی کردن؛ سەوداگەری کردن؛ ئالووێرکردن: ***( to ~ business)*** .
***v.i.*** [Rare], گفتوگۆی بازرگانی کردن؛ سەوداکردن.
**-transactor** ***(n.).***
**transaction** (tran-zak′shən), ***n.*** (١) کاروباری بازرگانی هەڵسووڕاندن: ***( He spends most of his time in business ~s .)*** .
(٢) ئالووێرێك یا کڕین و فرۆشتنێکی تایبەتی؛ سەوداگەرییەکی تایبەتی؛ کارێکی بازرگانی: ***( They did three ~s yesterday.)*** .
(٣) (*pl.*)، تۆمارنامەی کۆڕی ڕێکخراوێك، کۆنفرانسێك... هتد (بەتایبەتی هی بلاوکراوە).
**-transactional** ***(adj.).***
**transalpine** (trans-al′pin, tranz-al′pīn), ***adj.*** لەودیو چیای " ئالپ " موەیە.
**transatlantic** (trans′ət-lan′tik), ***adj.*** (١) ئەتلەنتی بڕ؛ بە زەریای ئەتلەنتیدا تێپەڕ دەبێت یا دەپەڕێتەوە: ***( a ~ airliner)***
(٢) لەودیو زەریای ئەتلەنتییەوەیە: ***( a ~ business)*** .
**transceiver** (tran-sē′vēr), ***n. Also*** **transmitter, receiver,** ئامێری بێ تەل نێرەرو وەرگر.
**transcend** (tran-send′), ***v.t.*** (١) لێ تێپەڕبوون؛ لەوە چوونە دەرەوە: ***( The story ~s belief.)***
(٢) بەرزتربوون لە؛ بەرزبوونەوە بەسەر؛ زیاتربوون لە.
(٣) لە بوونی ماددی یا سرووشت بەولاوە بوون (خودا)؛ لە جیهان بەدەربوون؛ لە تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەربوون.
***v.i.*** [Archaic], مەزنتر یا بەرزتربوون لە.
**transcendence** (tran-sen′dəns), ***n. Also*** **transcendency,**

بەرزی؛ بلندی: لێ تێپەڕبوون؛ لە جیهان بەدەری؛ لە تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەر.
**transcendent** (tran-sen′dənt), *adj.* (١) بەرز؛ بلند؛ سەرئاسا:
***(Shakespeare was a man of ~ genius.)***
(٢) لە جیهان بەدەر؛ لە سرووشت و تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەر.
**transcendental** (tran′sen-den′t′l), *adj.* (١) بلند؛ بەرز
(٢) لە سرووشت بەدەر؛ سەر سرووشت. (٣) لێڵ؛ نادیار؛ ڕووت.
(٤) لە بەسەرهاتی مرۆڤ بەدەر نەك لە تێگەیشتنی و زانیاری.
**transcendentalism** (tran′sen-den′t′l-iz′m), *n.* (١) (ا) ـ
فەلسەفەیەکە دەڵێت: کە ڕاستی لەڕێی بیرکردنەوەوە دەزانرێت نەك لەڕێی بەسەرهات و هەستەکانەوە. (ب) ڕاستی زانین لە خۆوە و لەڕێی هۆشی زگماکی نەك لەڕێی بەسەرهات. (٢) (ا) بیری ناکردەنی و خەیاڵ خاوی و نادیار.
(ب) بلندخوازی

**-transcendentalist** *(n.).*
**transcontinental** (trans′kon-tə-nen′t′l), *adj.* (١) کیشوەربڕ. کیشوەرێك دەبڕێت: ***(a ~ flight)***
(٢) لەودیوی کیشوەرێکەوەیە.
**transcribe** (tran-skrīb′), *v.t.* (١) وێنە لەبەر تۆمارکردن یا نووسین؛ وێنە دەستنووس کردن. (٢) گونجاندن یا سازاندنی پارچەیەك مۆسیقا بۆ ئامێرێکی جیا لەوەی کە لە سەرەتاوە بۆی دانراوە.
(٣) بەرنامەی ڕادیۆ تۆمارکردن بۆ بڵاوکردنەوەی لە دواڕۆژدا.
**-transcriber** *(n.).*
**transcript** (tran′skript′), *n.* (١) وێنەی لەبەر تۆمارکراو، نووسراوە، یا چاپکراو (٢) وێنەی تۆمارنامەی نمرەی قوتابی.
**transcription** (tran-skrip′shən), *n.* (١) وێنە لەبەر تۆمارکردن یا نووسینەوە. (٢) وێنەی لەبەر تۆمارکراو، نووسراوە، یا چاپکراو. (هەروەها " **transcript** ").
(٣) پارچەیەك مۆسیقای گونجێنراو بۆ ئامێرێکی مۆسیقای جیا لەوەی کە لە سەرەتاوە بوی دانراوە.
(٤) بەرنامەی ڕادیۆی تۆمارکراو بۆ بڵاوکردنەوەی لە دواڕۆژدا.
**transcurrent** (trans-kŭr′ənt), *adj.* بەسەردا تێپەڕبوو.
**transducer** (trans-dōōs′ēr, trans-dūs′ēr), *n.* ئامێری ووزەگۆڕ (فیزیا)
**transect** (tran-sekt′), *v.t.* بڕین لەم لاوە بۆ ئەولا؛ بەشکردن بە بڕین لە لایەکەوە بۆ لاکەی تر.
**-transection** *(n.).*
**transept** (tran′sept), *n.* باڵی کڵێسەی لە شێوەی خاچدا دروستکراو (خانووسازی)
**-transeptal** *(adj.).*
**transfer** (trans-fŭr′), *v.t.* (١) گواستنەوە؛ گۆڕین؛ گۆڕینەوە.
(٢) تاپۆی خانوو شتی تر خستنەسەر کەسێکی تر:
***(to ~ the title of a house or a car from one person to another.)***
(٣) وێنە یا نەخشە گواستنەوە لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی تر.
***v.i.*** (١) خۆ گواستنەوە؛ گواستنەوە:
***(He ~red to the university of California.)***
(٢) گوێزرانەوە.
(٣) گۆڕین (لە پاس، شەمەندەفەر، یا فڕۆکەیەکەوە بۆ یەکێکی تر).
***n.*** (١) (ا) گواستنەوە؛ گۆڕین؛ گوێزرانەوە. (ب) هۆی گواستنەوە.
(٢) وێنە یا نەخشەی گوێزراوە لە ڕوویەکەوە بۆ ڕوویەکی تر.
(٣) بلیتی (پاس) گۆڕین: بلیتێکە خاوەنەکەی دەتوانێ پاسی ناوشار یا ترامی پێ بگۆڕێ و سواری یەکێکی تر بێت (بۆ ئەوەی بگاتە ئەو شوێنەی کە دەیەوێ بۆی بچێ). (٤) شوێنی گۆڕین یا گواستنەوە.
(٥) بەڵگەنامەی گواستنەوەی قوتابی
(٦) (ا) تاپۆی خانوو خستنە سەر یەکێکی تر
(ب) بەڵگەنامەی ئەم گۆڕینەوەیە

**transferable** (trans-fŭr′ə-b′l), *adj.* دەگوێزرێتەوە؛ دەگۆڕدرێت؛ خاوەنەکەی دەتوانرێت بگۆڕرێت؛ دەتوانرێت لە یەکێکەوە بدرێت بە یەکێکی تر.
**transferee** (trans′fēr-ē′), *n.* (١) کەسێکە کە تاپۆی خانووی دەخرێتە سەر یا ئوتومبیل و شتی تر بە ناوییەوە تۆمار دەکرێ.
(٢) گوێزراوە (فەرمانبەر، قوتابی... هتد).
**transference** (trans-fŭr′əns, trans′fēr-əns), *n.* گواستنەوە؛ گوێزرانەوە؛ گۆڕینەوە؛ گۆڕین.
**-tranferential** *(adj.).*
**transferor** (trans-fŭr′ēr), *n.* کەسێکە کە تاپۆی خانوو یا ناوی ئوتومبیل و شتی تر دەخاتە سەر یەکێکی تر.
**transferrer** (trans-fŭr′ēr), *n.* گوێزەرەوە.
**transfiguration** (trans′fig-yoo-rā′shən), *n.* (١) ڕووخسار گۆڕان بەتەواوی؛ شێوە گۆڕین بەتەواوی.
(٢) (ا) ڕووناکی لێبوونەوە و ڕووخسار گۆڕانی عیسا لەسەر شاخەکە (ئینجیل).
(ب) جەژنی ئەم ڕووخسار گۆڕانە.
**transfigure** (trans-fig′yoor), *v.t.* (١) ڕووخسار گۆڕین بەتەواوی؛ شێوە گۆڕین. (٢) شێوە گۆڕین و شکۆ پێدان؛ وەك خوا لێکردن
**transfix** (trans-fiks′), *v.t.* (١) شتی تیژ پیاکردن؛ تیغ لێدان
(٢) تیغ پیاکردن و جووڵە لێ بڕین:
***(He ~ed his enemy with a sword.)***
(٣) سڕکردن؛ جووڵە لێ بڕین؛ ووشك بوون؛ سڕبوون:
***(He stood ~ed with amazement, horror, etc.)***
**-transfixation** *(n.).*
**transform** (trans-fôrm′), *v.t.* (١) ڕووخسار گۆڕین؛ شێوە گۆڕین.
(٢) بەتەواوی گۆڕین (بارودۆخ، چۆنێتی... هتد).
(٣) گۆڕین (ڕەفتار، کەسێتی: هەڵسان و دانیشتن).
(٤) گۆڕین (کارەبا). (٥) ووزە گۆڕین (فیزیا).
***v.i.*** [Rare], گۆڕان بەتەواوی.
**-transformable** *(adj.).*
**transformation** (trans′fēr-mā′shən), *n.* (١) گۆڕان؛ گۆڕین.
(٢) بارۆکەی ژن.
**transformer** (trans-fôr′mēr), *n.* (١) گۆڕەر (مرۆڤ، شت)
(٢) کارەباگۆڕ؛ گۆڕەری تەوژمی کارەبا.
**transfuse** (trans-fūz′), *v.t.* (١) شلە گواستنەوە؛ شلە لە دەفرێکەوە کردنە دەفرێکی تر.
(٢) بە هەموویدا بڵاوکردنەوە؛ هەمووی پێ گرتنەوە؛ بە هەموویدا کردن
(٣) خوێن گۆڕین؛ خوێن کردنە دەماری نەخۆشەوە.
**-transfusible** *(adj.).*
**transfusion** (trans-fū′zhən), *n.* خوێن کردنە نەخۆشەوە؛ خوێن گۆڕین؛ خوێن دان بە نەخۆش:
***(The patient was given a blood ~ .)***
**transgress** (trans-gres′, tranz-gres′), *v.t.* (١) شکاندن (یاسا)؛ پەرژین شکاندن. (٢) لە سنوور دەرچوون؛ لە ئەندازە بەدەربوون؛ زیادە ڕۆیشتن.
***v.i.*** یاسا شکاندن؛ گوناه کردن؛ تاوان کردن؛ پەرژین شکاندن.
**transgression** (trans-gresh′ən), *n.* (١) یاسا شکاندن؛ گوناه کردن؛ تاوان کردن؛ پەرژین شکاندن.
(٢) لە سنوور دەرچوون؛ زیادەڕۆیی.
**transgressive** (trans-gres′iv, tranz-gres′iv), *adj.* (١) یاسا شکێن؛ گوناهکار؛ پەرژین شکێن؛ تاوانکار.
(٢) لە سنوور دەرچوو؛ لە ئەندازە بەدەر.
**transgresser** (trans-gres′ēr, tranz-gres′ēr), *n.* یاساشکێن؛ پەرژین شکێن؛ گوناهکار؛ تاوانکار.
**tranship** (tran-ship′), *v.t.* = **transship.**
**transience** (tran′shəns), *n.* سەردەمی؛ زوو بەسەرچوون؛ زوو نەمان.
**transiency** (tran′shən-si), *n.* = **transience.**

**transient** (tran′shənt), ***adj.*** (١) کاتی: سەردەمی؛ زوو نامێنێ؛
زوو بەسەردەچێ: کورت. (٢) گەڕۆك: ڕەفتەنی: ***( a ~ laborer)*** .
***n.*** (١) میوانی ڕەفتەنی (بەتایبەتی لە میوانخانەدا).
(٢) (ا) کریکاری گەڕۆك: کەسێکە کە بە شوێن ئیشدا دەگەڕێ لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن ب: کەسێکی گەڕۆك
(٣) گۆڕینی کاتی تەووژمی کارەبا یا ڤۆلتەکەی
**transilient** (tran-sil′i-ənt), ***adj.*** لە شتێکەوە یا بارودۆخێکەوە بازدەر بۆ شتێك یا بارودۆخێکی تر.
**transilluminate** (trans′i-lū′mə-nāt′), ***v.t.*** ڕووناکی لێدان یا پیابردنی ئەندامێکی لەش بۆ تێڕوانینی (پزیشکەوانی).
**-transillumination** ***(n.).***
**transistor** (tran-zis′tēr, tran-sis′tēr), ***n.*** (١) ترانزستەر
ئامێرێکی ئەلەکترۆنی‌یە لە رادیۆو شتی تردا بەکاردەهێنرێ.
(٢) [Colloq.]. رادیۆی ترانزستەر (هەروەها " **transistor radio** ")
**transistorize** (tran-zis′tēr-iz′), ***v.t.*** ترانزستەر تیخستن
**transit** (tran′sit, tran′zit), ***n.*** (١) ترانزێت: تێپەڕین؛ تێپەڕبوون.
(٢) گواستنەوەی خەڵك و شتومەك (بەتایبەتی بەهۆی گواستنەوەی گشتی ناوخۆ وەك پاس) ***( people or goods in ~ )***
(٣) گۆڕین لە بارودۆخێکەوە بۆ یەکێکی تر (مردن، کۆمەڵ لە ڕژێمێکەوە بۆ ڕژێمێکی تر . هتد). (٤) ئامێری گۆشە پێوان (ڕووپێوی).
(٥) (ا) تێپەڕینی ئەستێرەیەك بە هێڵی درێژدا یا بە بەردەم دووربیندا.
(ب) تێپەڕینی ئەستێرەیەکی بچووك بەسەر یەکێکی گەورەدا.
***v.t.*** تێپەڕین (ئەستێرەناسی).
***v.i.*** (١) لە ترانزێتدا بوون؛ پێدا تێپەڕبوون. (٢) تێپەڕین (ئەستێرەناسی).
**transition** (tran-zish′ən), ***n.*** (١) گۆڕین (لە بارودۆخێك. شێوەیەك، قۆناغێك، کارێك، یا جێگەیەکەوە بۆ یەکێکی تر)؛ گۆڕان.
(٢) ماوەی گۆڕین: سەردەم یا کاتی گۆڕان.
(٣) ووشەی پەیوەندی: ووشەیەك یا دەستە ووشەیەکە کە بەندێك یا چەند ڕستەیەك دەگەیەنێ بە هی تر (ڕێزمان)؛ ووشەی گواستنەوە.
(٤) ئاوازی گۆڕین یا گواستنەوە
**transitional** (tran-zish′ən-'l, tran-sish′ən-'l), ***adj.*** تایبەتی بە گۆڕین یا گواستنەوە.
**transitive** (tran′sə-tiv), ***adj.*** (١) [Rare] . **transitional** .
(٢) تێپەڕ (کردار): ***( a ~ verb takes an object.)***
***n.*** کرداری تێپەڕ (ڕێزمان)
**transitoriness** (tran′sə-tôr′i-nis, tran′zə-tō′ri-nis), ***n.***
زوو بەسەرچوون: زوو نەمان؛ سەردەمێتی؛ کورتی
**transitory** (tran′sə-tôr′i, tran′zə-tō′ri), ***adj.*** سەردەمی: کاتی؛ زوو بەسەردەچێ؛ زوو نامێنێ؛ کورت.
**-transitorily** ***(adv.).***
**translatable** (trans-lāt′ə-b'l, tranz-lāt′ə-b'l), ***adj.*** دەتوانرێ وەرگێڕرێت: وەردەگێڕرێت (لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر).
**translate** (trans-lāt′, tranz′lāt), ***v.t.*** (١) گواستنەوە؛ گۆڕین:
(ا) بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان (بەبێ مردن). (ب) سەرەك قەشە گواستنەوە.
(ج) گواستنەوەی پاشماوەی پیاوێکی ئاینی پیرۆز لە گۆڕێکەوە بۆ یەکێکی تر.
(٢) وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بە نووسین)؛ پەرچڤەکردن؛ گۆڕین.
(٣) گۆڕین (لە مەیدانێکەوە بۆ مەیدانێکی تر: ***( to ~ ideas into action)*** .
(٤) لێکدانەوە
(٥) [Archaic or Rare]. شەیداکردن؛ گەشکەدارکردن.
(٦) بزواندن بە ڕێکی نەك بە خولانەوە (مەکینەناسی).
***v.i.*** (١) وەرگێڕان (لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر بە نووسین)؛ گۆڕین.
(٢) گونجان بۆ وەرگێڕان؛ وەرگێڕان بۆ هەبوون:
***( This poetry does not ~ easily.)***
**translation** (trans-lā′shən), ***n.*** (١) وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر: پەرچڤە. (٢) ئەنجامی ئەم وەرگێڕانە؛ دەقی وەرگێڕراو

(بەتایبەتی بەرهەمێکی وێژەیی): ***( This is a ~ .)*** .
(٣) بزوانی ڕێك نەك خولانەوە (مەکینەناسی).
**translator** (trans-lā′tēr, tranz′lā′tēr), ***n.*** (١) پەرچڤان؛ وەرگێڕ بە نووسین. (٢) **interpreter** .
**transliterate** (trans-lit′ə-rāt′, tranz-lit′ə-rāt′), ***v.t.*** نوسینی زمانێك بە ئەلف‌وبێی زمانێکی تر (بەپێی دەنگی تیپ و ووشەکان)
**transliteration** (trans-lit′ə-rā′shən), ***n.*** (١) نووسینی زمانێك بە ئەلف‌وبێی زمانێکی تر (بەپێی دەنگی تیپ و ووشەکان).
(٢) ووشە، ڕستە، یا دەقی وەها نووسراو.
**translocate** (trans-lō′kāt), ***v.t.*** گواستنەوە؛ لە جێی خۆ لابردن؛ بار گۆڕین.
**-translocation** ***(n.).***
**translucence** (tranz-lū′s'ns), ***n.*** ڕۆشنی؛ ڕوونی.
( هەروەها " **translucency** ").
**translucent** (trans-lōō′s'nt, tranz-lū′s'nt), ***adj.*** (١) ڕۆشن؛ ڕوون. (٢) نیمچە ڕۆشن؛ نیمچە ڕوون.
**-translucently** ***(adv.).***
**translucid** (tranz-lū′sid), ***adj.*** = **translucent.**
**transmarine** (trans′mə-rēn′), ***adj.*** (١) بە دەریادا تێپەڕبوو؛ دەریابڕ. (٢) لەودیوی دەریاوەیە.
**transmigrant** (trans-mī′grənt), ***n.*** (١) کۆچکەر (لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر)؛ بارکەر. (٢) کۆچکەرێکە بەڕێوەیە بۆ ئەو وولاتەی کە بۆی دەچێ.
**transmigrate** (trans-mī′grāt, tranz-mī′grāt), ***v.i.*** (١) کۆچ کردن (لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر)؛ بارکردن.
(٢) چوونە ناو لەشی کەسێکی ترەوە (گیانی مردوو)؛ گوێزانەوەی گیانی مردوو بۆ لەشێکی زیندوو.
**-transmigrator** ***(n.)***; **transmigratory** ***(adj.).***
**transmigration** (trans′mī-grā′shən), ***n.*** (١) کۆچ؛ کۆچ کردن (لە وولاتێکەوە بۆ وولاتێکی تر)؛ بارکردن.
(٢) چوونە ناو لەشێکی ترەوە (گیانی مردوو)؛ گوێزانەوەی گیانی مردوو بۆ لەشێکی زیندوو: ***( the ~ of souls)*** .
**transmissible** (trans-mis′ə-b'l), ***adj.*** دەنێررێ؛ دەگوێزرێتەوە؛ دەگەیەنرێ.
**-transmissibility** ***(n.).***
**transmission** (trans-mish′ən), ***n.*** (١) پێ گەیاندن؛ گەیاندن؛ ڕاگەیاندن؛ پێ گەیشتن؛ بڵاوبوونەوە: ***( the ~ of news, disease, etc.)*** .
(٢) شتی پێ ڕاگەیەنراو یا پێ گەیەنراو؛ بڵاونامە؛ نامە.
(٣) ناردن (بەرنامە یا شەپۆلی رادیۆ).
(٤) ترانسمیشن: ئامێری ووزە گەیاندن (ئوتومبیل... هتد).
**-transmissive** ***(adj.).***
**transmit** (trans-mit′, tranz-mit′), ***v.t.*** (١) گەیاندن؛ گواستنەوە.
(٢) پێدان؛ بۆ بەجێهێشتن:
***( Parents ~ some of their characteristics to their children.)***
(٣) پێ ڕاگەیاندن؛ پێ گەیاندن.
(٤) پێدابردن (ڕووناکی، گەرمی، یا دەنگ بە هەوادا).
(٥) گەیاندن: ***( Iron ~s heat.)*** .
(٦) گەیاندن (ووزە لە مەکینەوە بۆ پەروەرەوە وەك ئوتومبیل... هتد).
(٧) ناردن (رادیۆ)؛ بڵاوکردنەوە.
**-transmittable; transmittible** ***(adj.).***
**transmittal** (trans-mit′'l), ***n.*** = **transmission.**
**transmitter** (trans-mit′ēr, tranz-mit′ēr), ***n.*** (١) گەیەنەر (مرۆڤ)؛ پێ گەیەنەر؛ نێرەر. (٢) ئامێری ناردن (رادیۆ، تەلەفزیۆن، تەلەفۆن، برووسکە)؛ نێرەر؛ بڵاوکەر.
**transmogrify** (trans-mog′rə-fī′), ***v.t.*** شێوە گۆڕین بە جۆرێکی

زۆر سەیر: شێوە گۆڕین و تێکدان یا شێواندن.

**-transmogrification** *(n.).*

**transmontane** (trans-mon′tān), *n.* = **tramontane**.

**transmutation** (trans′mū-tā′shən), *n.* (١) گۆڕین: گۆڕانی تەواو. (٢) [Rare]، گۆڕانی هەمیشەیی.
(٣) بەناو گۆڕینی کانزای بێ نرخ بۆ زێڕو زیو (کیمیاگەری کۆن).
(٤) گۆڕانی توخمی (فیزیا).

**-transmutational; transmutative** *(adj.).*

**transmute** (trans-mūt′, tranz-mūt′), *v.t.* گۆڕین (شێوە، توخم، باروودۆخ، ماددە... هتد).

**-transmutability** *(n.)*; **transmutable** *(adj.)*; **transmutableness** *(n.).*

**transoceanic** (trans′ō-shi-an′ik), *adj.* (١) زەریابڕ: بە زەریادا تێپەڕبوو. (٢) لەودیوی زەریاوەیە: لە پشت زەریاوە.

**transom** (tran′səm), *n.* (١) (أ) داری سەر دەرگا. (ب) داری ئاسۆیی بەینی پەنجەرە: داری ئاسۆیی بەینی دەرگاو پەنجەرەی سەری.
(٢) پەنجەرەی بچووکی سەر دەرگا یان پەنجەرەیەکی گەورە.
(٣) (أ) داری ئاسۆیی خاچ و سێدارە. (ب) دەستەك (کەشتی).

**transonic** (tran-son′ik), *adj.* = **transsonic**.

**transpacific** (trans′pə-sif′ik), *adj.* (١) (زەریای) پاسیفیك بڕ: بە (زەریای) پاسیفیکدا تێپەڕ دەبێت. (٢) لەودیو زەریای پاسیفیکەوە.

**transparence** (trans-pâr′əns), *n.* ڕۆشنی: ڕوونی

**transparency** (trans-pâr′ən-si), *n.* (١) ڕۆشنی: ڕوونی.
(٢) پارچەیەك شتی ڕۆشنە وەك پلاستیك وێنەو نووسراوی لەسەر کراوە کە ڕووناکی حرایە سەر وێنەو شتە نووسراوەکان دەردەکەون.

**transparent** (trans-pâr′ənt), *adj.*. (١) ڕۆشن: ڕوون: ***( ~ cloth)***
(٢) دیار: ئاشکرا: لەڕوو: ***( a ~ lie; a man of ~ honesty)*** .
(٣) ڕوون ***( a writer with a ~ style)*** .

**-transparently** *(adv.)*; **transparentness** *(n.).*

**transpierce** (trans-pērs′), *v.t.* (١) کوناودەرکردن: دیوا‌ودەرکردن
(٢) کونکردن: سمین.

**transpiration** (tran′spə-rā′shən), *n.* ئاودەردان (ڕووەك): ئارەق دەردان: ئارەق دەرکردن.

**transpire** (tran-spīr′), *v.t.* ئارەق پێ کردن: ئارەق پێ دەردان: ئاو پێ دەردان (ڕووەك).
*v.i.* (١) ئارەق کردن: ئارەق دەردان: ئاو دەردان (ڕووەك).
(٢) دادان: لێوە هاتنە دەرەوە: دەردان: دەلاَن
(٣) دەرکەوتن: ئاشکرابوون:
***( It ~d that the fire was caused by a carless smoker.)***
(٤) ڕوودان: ***( Important events ~d last week.)*** .

**transplant** (trans-plant′, trans-plänt′), *v.t.* (١) هەڵکەندن لە شوێنێك و ڕواندن لە شوێنێکی تر (٢) خەڵك هەڵکەندن لە شوێنی خۆیان و جێنشین کردنیان لە شوێنێکی تر: گواستنەوە. (٣) ئەندام یا شانە لە کەسێك وەرگرتن و ڕواندنی لە کەسێکی تردا (نەشتەرگەری).
*v.i.* (١) گواستنەوەو ڕواندن. (٢) بەرگەی گواستنەوەو ڕواندن لە شوێنێکی تر دەگرێت: دەتوانرێت هەڵکەنرێت و لە شوێنێکی تر بڕوێنرێت:
***( Some plants do not ~ as well as others.)***
*n.* (١) گواستنەوەو ڕوان. (٢) شتی گوێزراوەو ڕوێنراو (ڕووەك، ئەندامی لەش).

**-transplantation** *(n.)*; **transplanter** *(n.).*

**transpolar** (trans-pō′lēr), *adj.* تەوەربڕ: تەوەری باکووری یا باشووری دەبڕێت.

**transponder** (trans-pon′dēr), *n.* لاسلکی یا ڕاداری نامە وەرگرو نێردەر

**transpontine** (trans-pon′tin, trans-pon′tīn), *adj.* (١) لەوبەر پردەوە. (٢) تایبەتی بە دیوی باشووری ڕووباری " تێمس " لە لەندەن.

**transport** (trans-pôrt′, trans-pōrt′), *v.t.* (١) گواستنەوە (بە هۆی هاتوچۆ): گوێزانەوە: بردن. (٢) گەشکەدارکردن: شێت و شەیدا کردن
(٣) لە وولاَت دوورخستنەوە (بەتایبەتی تاوانکار): دەرکردن.
(٤) [Obs.]، کوشتن.
*n.* (١) گواستنەوە (بۆ شوێنی دوور): گوێزانەوە: بردن. (٢) گەشکە: شەیدایی.
(٣) کەشتی سەربازو کەرەسەی سوپا گواستنەوە.
(٤) فڕۆکەی گەورەی ڕێبوارو بار.
(٥) تاوانکاری دوورخراوە لە وولاَت.

**-transportability** *(n.)*; **transportable** *(adj.)*; **transporter** *(n.).*

**transportation** (trans′pēr-tā′shən), *n.* (١) گواستنەوە: گوێزانەوە: هاتوچۆ
(٢) هۆی گواستنەوە: هۆی هاتوچۆ: ***( Their ~ was camel.)*** .
(٣) کرێی هاتوچۆ یا گواستنەوە. (٤) بلیتی هاتوچۆ: تکت.
(٥) دوورخستنەوە لە وولاَت (تاوانکار): دەرکردن.

**transpose** (trans-pōz′), *v.t.* (١) [Rare] ، گواستنەوە.
(٢) جێ گۆڕکێ پێ کردن: ئاڵوگۆڕ پێ کردن: جێ گۆڕینەوە:
***( to ~ the words in a sentence)***
(٣) ئاڵوگۆڕکردنی لاکانی کێشەی جەبری.
(٤) گۆڕینی پلەی مۆسیقا. (٥) [Obs.]، گۆڕین (شێوە).
*v.i.* (١) گۆڕینی پلەی مۆسیقا. (٢) بۆ جێ گۆڕکێ گونجان.

**-transposable** *(adj.).*

**transposition** (trans′pə-zish′ən), *n.* (١) جێ ئاڵوگۆڕکردن: جێ گۆڕکێ. (٢) شتی جێ گۆڕکێ پێ کراو.

**transsexual** (trans-sek′shōō-əl), *adj.* (١) پیاوی سەر ژنانی: کچە کوڕانی: پیاوێکە کە حەز دەکات ژن بووایە: ژنێکە کە حەز دەکات پیاو بووایە. (٢) پیاوێکە کە خۆی دەکات بە ژن بە نەشتەرگەری: ژنێکە کە خۆی دەکات بە پیاو بە نەشتەرگەری.

**transship** (trans-ship′, tran-ship′), *v.t.* گواستنەوە لە کەشتی، شەمەندەفەر، یا ئوتومبیلێکەوە بۆ یەکێکی تر بۆ ناردن.
*v.i.* بار گواستنەوە لە کەشتییەکەوە بۆ یەکێکی تر بۆ ناردن.

**-transshipment** *(n.).*

**transsonic** (trans-son′ik, tran-son′ik), *adj.* بە خێرایی دەنگ دەڕوات.

**transubstantiate** (tran′səb-stan′shi-āt′), *v.t.* (١) گۆڕین (لە ماددەیەکەوە بۆ ماددەیەکی تر). (٢) گۆڕینی نان و مەی بۆ لەش و خوێنی عیسا (شێوی خواهانە).

**-transubstantiation** *(n.).*

**transudate** (tran′soo-dāt′, tran′syoo-dāt′), *n. Also* **transudation**, (١) شلەی دەردراو: شلەی تێزاو (٢) شلە دەردان: ئاو دەردان: دەلاَن: تێزان.

**transude** (tran-sōōd′, tran-sūd′), *v.i.* شلە دەردان: ئاو دەردان: ئارەق دەردان: تێزان: لێوە هاتن.
*v.t.* ڕێگەدان (بۆ پێدا ڕۆیشتن)

**transvalue** (trans-val′ū), *v.t.* سەرلەنوێ هەڵسەنگاندن: هەڵسەنگاندن بەپێی پێوەری نوێ.

**transversal** (trans-vūr′s'l, tranz-vūr′s'l), *adj.* لەم لاوە بۆ ئەولا: لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕ
*n.* هێڵێکە کە دوو هێڵی تر یا زیاتر دەبڕێ.

**transverse** (trans-vūrs′, tranz-vūrs′), *adj.* لەم لاوە بۆ ئەولا: لەم پەڕەوە بۆ ئەوپەڕ.
*n.* داری ڕایەڵ کراو لەم بەرەوە بۆ ئەوبەر: دەستەك: نیرگە.

**transvestism** (trans′ves-tiz'm), *n. Also* **transvestitism**, (١) حەزی ژن و پیاو بە خۆگۆڕین و جلی یەکتر لەبەرکردن.

(٢) ئەم خۆگۆڕین و جلی یەکتر لەبەرکردنە.

**transvestite** (trans-ves′tīt), ***n.*** ژن یا پیاوێکە کە حەز لە خۆگۆڕین و جلی ئەوی تر لەبەرکردن دەکات.

**trap** (trap), ***n.*** (١) تەڵە؛ داو. (٢) پیلان.

(٣) بۆنگیر: بۆرییەکی چەماوەیە لە شێوەی ( U ) یا ( S ) دا کە دەبەسترێت بە بۆری ئاوەڕۆی ناوماڵەوە ئاوی تێدا دەمێنێتەوە بەم جۆرە ڕێگە لە گەڕانەوەی بۆنی پیس و هەوا دەگرێ.

(٤) ئامێرێکە بۆ تۆپ و شت هاویشتن بە هەوادا بۆ تەقەلێکردن.

(٥) گالیسکەی سووکی دووپێچکەیی یەك ئەسپی.

(٦) rattle-trap (٧) **trap door**.

(٨) ( *pl.* ). ئامێرێکی مۆسیقییە کە لێی دەدرێ بۆ ئەوەی لێدرێ (تەپڵ، زەنگ، زیلی مس هتد). (٩) [Slang]، دەم؛ زار.

(١٠) کەندوکۆسپ و داوی یاری گۆڵف: ***( a sand ~ )***.

***v.t.*** (١) بە تەڵە گرتن. (٢) کردن بە داوەوە؛ بەستنەوە؛ قەتیس کردن.

(٣) ڕێگە لە بۆنی پیس گرتن بە بۆری چەماوە (ژمارە سێ ببینە).

(٤) ئەم جۆرە بۆرییە پێوەبەستن.

***v.i.*** (١) تەڵە نانەوە.

(٢) تەڵە نانەوە بۆ گیانەوەری کەوڵدار (بۆ فرۆشتن).

**trap** (trap), ***n. Also*** **traprock,** جۆرە بەردێکی ڕەشی ئاگرپژێنییە.

**trap** (trap), ***v.t.*** [Obs.], سەرزین لێکردن و گێسووگوڵنگ لە ئەسپ دان.

***n.*** (١) [Obs.]، سەرزین و گێسووگوڵنگی ئەسپ.

(٢) (*pl.*) [Colloq.]، جانتا و شتومەکی کەسێك.

**trapan** (trə-pan′), ***n. & v.t.*** = **trepan.**

**trap door,** دەرگایەکی ئاسۆیی نهێنییە لە زەمینەی ژوور یا بنمیچدا.

**trapeze** (trə-pēz′, tra-pēz′), ***n.*** (١) جۆلانێی تەنافبازو وەرزشکار. (٢) **trapezium ( 1 & 2 )**.

**trapeziform** (trə-pē′zə-fôrm′), ***adj.*** لەبزینەیی

**trapezium** (trə-pē′zi-əm), ***n.*** (١) لەبزینەیی خوار؛ وێنەیەکی چوارلاییە هێڵەکانی هیچیان هاوڕێك نین. (٢) [British]، **trapezoid**.

(٣) ئێسقانی بنی کەڵەموست

**trapezius** (trə-pē′zi-əs), ***n.*** ماسولکەی پشتی مل و شان و سنگ (کە سەر ڕادەگرێ).

**trapezohedron** (trə-pē′zə-hē′drən), ***n.*** بلووری ڕوو لەبزینەی ناڕێك

**trapezoid** (trap′ə-zoid′), ***n.*** (١) وێنەیەکی چوارلاییە دووانیان هاوڕێکن. (٢) [British]، **trapezium**.

(٣) ئێسقانی بنی پەنجەی دۆشاوەژە.

**trappean** (trap′i-ən, trə-pē′ən), ***adj. Also*** trappous, وەك بەردی ئاگرپژێنی " تراپ ".

**trapper** (trap′ẽr), ***n.*** نێچیرەوان بە تەڵە (بۆ کەوڵی نێچیرەکە).

**trappings** (trap′iŋz), ***n.pl.*** (١) سەرجل و گێسووگوڵنگی ئەسپ.

(٢) جلی جوان و نەقش و نیگارو شتی ڕازانەوە؛ تەنتەنە؛ نیشانی جوان:

***( the ~ of power; Although the king had all the ~ of royalty, he had very little real power.)***

**Trappist** (trap′ist), ***n.*** کەشیش یا ووشکەسۆفی پەرستگای " لاتراپ " کە هەرگیز قسە ناکەن.

***adj.*** تایبەتی بەم کەشیش یا ووشکەسۆفییانە.

**trapshooting** (trap′shōōt′iŋ), ***n.*** نیشان گرتنەوە لە کۆتری گڵینەو تۆپی شووشەی بە هەوادا هاوێژراو.

**-trapshooter** ***(n.).***

**trash** (trash), ***n.*** (١) لق و پۆپی بڕاو و فڕێدراو؛ چڵ و چێو و کەڵاو تونکڵەدار هتد. (٢) زبڵ؛ خاك و خۆڵ؛ پاشماوە؛ سەرکۆزەر

(٣) (ا) قسە و بیروڕای هیچ و پووچ و بێ مانا. (ب) بەرهەمی وێژەیی و هونەری هیچ و پووچ. (٤) (ا) کەسێکی بێ نرخ و هیچ و پووچ

(ب) کۆمەڵە خەڵکی بێ نرخ و نەزان و هیچ و پووچ؛ ڕووتەوپووتە

(٥) سەرکۆزەری قامیشی شەکر.

***v.t.*** (١) لق و پۆپ و گەڵای ووشك لێکردنەوە.

(٢) فڕێدانە ناو تەنەکەی زبڵەوە؛ فڕێدان.

(٣) تێك و پێکدان؛ وەك کەلاوە لێکردن؛ وێرانکردن:

***( They ~ed the house and left.)***

**trash** (trash), ***v.t.*** (١) [Obs.]، ڕەشمەکردن (تانجی و سەگی ڕاو).

(٢) [Archaic]، بەستنەوە؛ جڵەوگرتن.

***n.*** [British Dial.], ڕەشمە؛ ڕەشوە.

**trash-bin** (trash′bin′), ***n.*** زبڵدانی گەورە.

**trash-can** (trash′kan′), ***n.*** زبڵدان؛ تەنەکەی خۆڵ.

**trashy** (trash′i), ***adj.*** بێ نرخ؛ هیچ و پووچ؛ پیس و بۆگەن:

***( ~ ideas, writings, people, etc.)***

-trashily ***(adv.)***; **trashiness *(n.)*.**

**trass** (tras), ***n.*** بەردی ئاگرپژێنی (لە چیمەنتۆدا بەکاردەهێنرێ).

**trauma** (trô′mə, trou′mə), ***n.*** (١) (ا) برین؛ برینداری.

(ب) ئەنجامی ئەم برینداریە لەسەر مێشك و هەست.

(٢) خورپە؛ کارەساتێکی ناخۆشە کە لەبیر ناچێتەوە؛ بریندار بوونی هەست و نەست؛ ڕاتەکان (دەروونناسی)

**traumatic** (trô-mat′ik), ***adj.*** (١) خورپەیی؛ زۆر ناخۆش؛ ڕاتەکێن (دەروونناسی)؛ هەست و نەست بریندارکەر: ***( a ~ experience)***.

(٢) هی دەرمانکردن؛ دەرمانکەری.

-traumatically ***(adv.).***

**traumatism** (trô′mə-tiz′m), ***n.*** (١) برین؛ برینداری.

(٢) ئەنجامی ئەم برینداریە لەسەر هەست و نەست.

**traumatize** (trô′mə-tīz′), ***v.t.*** (١) بریندارکردن؛ زامدارکردن.

(٢) خورپە لێدان؛ هەست و نەست بریندارکردن؛ ئازاردان (دەروونناسی).

**travail** (trav′āl, trav′′l), ***n.*** (١) ڕەنج؛ هەوڵ؛ تێکۆشان؛ ئارەق ڕشتن.

(٢) ژان (منداڵبوون). (٣) ئازاری تیژ؛ ئێش و ئازاری زۆر؛ ژان.

***v.i.*** (١) ڕەنجدان؛ تێکۆشان؛ ئارەق ڕشتن؛ زۆر هەوڵدان. (٢) ژان گرتن.

**trave** (trāv), ***n.*** (١) (ا) دەستەك؛ داری دارەڕا.

(ب) بەشێکی بنمیچی بە دەستەك کراو. (٢) چوارچێوەیەکە ئەسپی سێرکی تێدا دەبەسترێتەوە لەکاتی ناڵ کردندا.

**travel** (trav′′l), ***v.i.*** (١) گەشت کردن؛ چوون بۆ گەشت؛ گەڕان.

(٢) هاتوچۆکردن بە ئیش (وەك فرۆشیاری گەڕۆك).

(٣) بزوان (ڕووناکی، دەنگ)؛ ڕۆیشتن:

***( Light ~s faster than sound.)***

(٤) هاودەمی کردن؛ لەگەڵ هەڵسان و دانیشتن:

***( He ~s in wealthy circles.)***

(٥) گوێزانەوە.

(٦) [Colloq.]، خێرا ڕۆیشتن.

***v.t.*** پێدا ڕۆیشتن؛ پێدا گەڕان؛ پێدا گەشت کردن.

***n.*** (١) گەشت؛ گەشت کردن؛ گەڕان.

(٢) (*pl.*)، (ا) گەشت و گەڕانی کەسێك یا دەستەیەك (ب) گەشتنامە

(٣) هاتوچۆ؛ بزوان؛ جووڵە (٤) هاتوچۆ بەسەر ڕێگەیەکی تایبەتیەوە (ئۆتومبیل، کەشتی، کاروانچی... هتد).

(٥) (ا) بزوان (مەکینەناسی). (ب) ماوەی ئەم بزوانە.

**travel agency,** دەڵاڵخانەی گەشت.

**travel agent,** دەڵاڵی گەشت.

**traveled, travelled** (trav′′ld), ***adj.*** (١) گەشتی زۆر کردووە؛ زۆر گەڕاوەو شارەزایە. (٢) هاتوچۆی زۆر پێدا دەکرێ: ***( a ~ road)***

**traveler, traveller** (trav′′l-ẽr, trav′lẽr), ***n.*** (١) گەشتیار؛ کاروانی؛ ڕێبوار؛ ڕەوەند. (٢) کەسێکە کە زوو زوو دەچێ بۆ گەشت؛ گەڕۆك.

(٣) [Chiefly British]، **traveling salesman**.

(٤) (ا) ئەڵقەیەکە کە بە پەتێك یا شیشێکدا دێت و دەچێ (کەشتیوانی)

(ب) ئەم پەتە یا شیشە.

**traveler's check,** چەکی گەشتیار؛ چەکی ڕێبوار.

**traveling salesman,** فرۆشیاری گەڕۆك (بۆ خۆی یا بۆ کۆمپانیایەك).

**travelogue, travelog** (trav′ə-lôg′, trav′ə-log′), ***n.*** گەشت نامە: (ا) فیلمی گەشت. (ب) دووانێك بە وێنەوە دەربارەی گەشت.

**traversal** (trav′ēr-s'l), ***n.*** بەڕینەوە؛ بڕین (هاتوچۆ).

**traverse** (trav′ẽrs, trə-vũrs′), ***v.t.*** (١) (ا) پێدا پەڕینەوە؛ پێدا ڕۆیشتن. (ب) هاتوچۆکردن؛ چوون‌و هاتن.
(٢) لابەلا پێدا ڕۆیشتن؛ قەدبڕکردن. (٣) دژ وەستان؛ بەرهەڵستی کردن؛ بەرگرتن.
(٤) باش لێ وردبوونەوە؛ لێکۆڵینەوە.
(٥) خولاندنەوە بە دەوری خۆیدا (تۆپ بۆ تەقاندن).
(٦) حاشاکردن (دادگا)؛ بە درۆ خستنەوە.

***v.i.*** (١) پەڕینەوە؛ پێدا ڕۆیشتن؛ بڕین؛ بەسەردا پەڕینەوە.
(٢) هاتوچۆکردن؛ هاتن‌و چوون
(٣) خولانەوە بە دەوری خۆدا؛ سووڕانەوە؛ چەرخان.
(٤) بە پێچاوپێچ بە گرددا خلیسکان (بەفرەخلیسکێ)؛ بە پێچاوپێچ بە گرددا سەرکەوتن؛ لابەلا ڕۆیشتن (ئەسپ).

***n.*** (١) (ا) هێڵێکە کە چەند هێڵێکی تر دەبڕێ.
ب) دەستەك؛ داری بەسەردا ڕایەڵ کراو.
ج) پەردەی لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر (د) دیواری سەنگەر.
ھ) باڵکۆن یا تارمەیەکە بە درێژایی خانوویەك
و) هێڵی ڕاستی ڕووپێوان.
(٢) (ا) کۆسپ؛ قۆرت؛ بەربەست. (ب) تێپەڕبوون؛ پێدا یا بەسەردا ڕۆیشتن
(٣) (ا) ڕۆیشتنی پێچاوپێچ (بەفرەخلیسکێ).
ب) بزوان بە لادا؛ جووڵەی لەملاوە بۆ ئەولا.
ج) خوولانەوە؛ سووڕانەوە؛ چەرخە؛ خول؛ سوور.
د) پارچەی مەکینەیەکە کە بزوانی پێچاوپێچ، ئەملا بۆ ئەولا، یا خولاوە بە ئەنجام دەگەیەنێ. (٥) ڕێ؛ ڕێی بەڕینەوە یا تێپەڕبوون؛ ڕێڕەو.
(٦) (ا) ڕێی پێچاوپێچی کەشتی (بۆ بەرهەڵستی کردنی با).
ب) قۆناغێکی ئەم جۆرە ڕێگەیە یا ڕۆیشتنە.
(٧) حاشا (دادگا)؛ حاشاکردن؛ بە درۆ خستنەوە.

***adj.*** (١) لەم لاوە بۆ ئەولا؛ لەم بەر بۆ ئەوبەر؛ ئەم بەرو ئەوبەری
(٢) تایبەتی بە پەردەی بە لادا کراوە.

**-traversable** ***(adj.)***; **traverser** ***(n.)***.

**travertin** (trav′ēr-tin), ***n.*** = **travertine.**

**travertine** (trav′ẽr-tin, trav′ēr-tēn′), ***n.*** بەردەگەچ.

**travesty** (trav′is-ti), ***n.*** (١) دەمەلاسکێ؛ لاسایی لاقرتێیانە؛ لاسایی کردنەوە. (٢) وێنەی سەیرو شێواوی شتی ڕاستەقینە؛ شێوەی درۆزنە؛ نموونەی بێ ماناو شێواو: ***( The trial was a ~ of justice.)***.

***v.t.*** لاسایی کردنەوە بۆ گاڵتەپێکردن؛ دەمەلاسکێ کردن.

**travois** (trə-voi′), ***n. Also*** **travoise,** گالیسکەیەکی سەرەتایی هیندییە ئەمەریکاییەکانە

**trawl** (trôl), ***n.*** (١) تۆڕی گەورەی ڕاوەماسی (بەلەمی ڕاوەماسی بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشێت). (٢) **setline**.

***v.t. & v.i.*** ڕاوەماسی کردن بە تۆڕ

**trawler** (trôl′ēr), ***n.*** (١) ڕاوەماسی کەر بە تۆڕ
(٢) بەلەمی ڕاوەماسی (وشەی پێشوو ببینە).

**tray** (trā), ***n.*** (١) سینی.
(٢) پڕ سینییەك؛ سینییەك شت ***( a ~ of food)***.
(٣) چەکمەچ؛ چاوی دۆلاب

**treacherous** (trech′ēr-əs), ***adj.*** (١) ناپاك؛ نهێنکر؛ پەیمان شکێن
***( a ~ person, act, etc.)***
(٢) پشت پێ نەبەستراو؛ خراپ؛ هەر بە ڕواڵەت باش.
***( ~ weather, rocks, etc.)***

**-treacherously** ***(adv.)***; **treacherousness** ***(n.)***.

**treachery** (trech′ēr-i), ***n.*** (١) ناپاکی؛ نهێنکری؛ پەیمان شکێنی
(٢) کارێکی ناپاکانە؛ نموونەیەکی نهێنکری یا ناپاکی.

**treacle** (trē′k'l), ***n.*** (١) (ا) دەرمانی ژەهر؛ دژە ژەهر.
(ب) دەرمان؛ چارە؛ دەرمانی کاریگەر. (٢) [British]، **molasses**.

**-treacly** ***(adj.)***

**tread** (tred), ***v.t.*** (١) پێدا ڕۆیشتن؛ بە پێ بەسەردا ڕۆیشتن؛ بە پێ ڕۆیشتن؛ کوتان (ڕێ).
(٢) پەیڕەوی کردن بە ڕۆیشتن، هەنگاونان، سەما... هتد
(٣) پێ خستنە سەر؛ پێ پیانان؛ پێشێل کردن؛ پەستنەوە
(٤) بە زۆر هێنانە ژێر بار؛ پێپەست کردن (چەوساندنەوە)
(٥) لێ پەڕین (باڵندەی نێر)؛ جووت بوون لەگەڵ؛ سواربوون
(٦) کردن بە ڕێچکە یا ڕێ (بە پێدا ڕۆیشتن):
***( The cattle had trodden a path to the pond.)***
(٧) تایە دەورگرتن؛ لاستیکی تازە تێگرتنی تایەی ئوتومبیل.

***v.i.*** (١) بە پێ ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتن:
***( She trod lightly in order not to wake the baby.)***
(٢) ( **~ on** )، هەنگاونان.
(٣) ( **~ on ; ~ upon** )، پێ پیانان؛ پێشێل کردن.
(٤) پەڕین (باڵندە)؛ جووت بوون.

***n.*** (١) [Rare]، شوێن پێ؛ جێ پێ.
(٢) بە پێ ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتن؛ پێدا ڕۆیشتن.
(٣) دەنگی پێ؛ دەنگی ڕۆیشتن؛ جۆری ڕۆیشتن.
(٤) ئەوەی کەسێك یا شتێك بەسەریدا دەڕوات یا پێی دەڕوات؛ ئەو بەشەی بەر زەوی دەکەوێ (بنی پێڵاو، سەری هێڵی ئاسن، دیوی دەرەوەی تایەی ئوتومبیل، سەری پلە پەیژەو پلەی پێ پلیکانە... هتد

**tread in a person's footsteps,** لەسەر ڕێ‌و شوێنی کەسێکی تر ڕۆیشتن؛ چاولێکردن.

**tread on air,** هەست بە خۆشی کردن؛ زۆر دڵخۆش بوون.

**tread on one's toes,** زویرکردن؛ هەست بریندارکردن؛ دڵ ئێشاندن.

**tread water,** پێ مەلە کردن.

**treadle** (tred′'l), ***n.*** پایدەری مەکینەی جل دوورین.

***v.t.*** ئیش پێکردنی ئەم پایدەرە یا بەکارهێنانی.

**treadmill** (tred′mil′), ***n.*** (١) ئاشی پێ پیانان: (ا) ئاشێکە لە کۆندا دەگەڕا بە ڕۆیشتن بەسەر چەرخێکی گەورەی خولاوە لە جێی خۆیدا. (ئەمە زوو بەکاردەهێنرا بۆ سزادانی زیندانی‌و وەرزش پێکردنیان).
(ب) ئاشێکە بە ڕۆیشتنی ئەسپ دەگەڕێ بەسەر قایشێکی پانی هەمیشە خولاوە لە جێی خۆیدا. (٢) قایشێکی پانی هەمیشە خولاوەیە لە جێی خۆیدا کەسێکی بەسەردا دەڕوات بۆ ئەوەی بزانرێ نەخۆشی دڵی هەیە یاخود نا. (٣) ئیشی ووشك‌و ناخۆش‌و دوایی نەهاتوو

**treason** (trē′z'n), ***n.*** (١) ناپاکی دژی وڵات‌و گەل.
(٢) [Rare]، پەیمان شکێنی؛ نهێنبری؛ دەستبری

**treasonable** (trē′z'n-ə-b'l), ***adj.*** ناپاك (بەرامبەر گەل‌و وڵات)؛ تایبەت بە ناپاکی: ***( a ~ speech)***.

**treasonous** (trē′z'n-əs), ***adj.*** = **treasonable.**

**treasure** (trezh′ẽr), ***n.*** (١) گەنجینە؛ سامان؛ خەزنە؛ پارەو خشڵ‌و شتی تری بەنرخ. (٢) کەسێك یا شتێکی بەنرخ

***v.t.*** (١) هەڵگرتن؛ خستنە گەنجینەوە؛ پاشەکەوت کردن؛ کۆکردنەوە
(٢) زۆر لا بەنرخ بوون؛ زۆر بەنرخ دانان:
***( He ~s the watch his mother gave him. I ~ your friendship.)***

**treasure house,** گەنجینە؛ سامانخانە.

**treasurer** (trezh′ẽr-ẽr), ***n.*** گەنجینەوان؛ خەزنەدار:
***( the ~ of a club)***

**treasure-trove** (trezh′ẽr-trōv′), ***n.*** (١) گەنجینە یا خەزنەی شاراوەی دۆزراوەی بێ خاوەن. (٢) شتێکی دۆزراوەی بەنرخ

**treasury** (trezh′ẽr-i), ***n.*** (١) گەنجینە؛ سامانخانە.
(٢) گەنجینەی گشتی یا کۆمپانیایەك.

(٣) پارەو سامانی ناو ئەم گەنجینەیە (٤) [T-]، وەزارەتی دارایی؛ دارایی.
(٥) کۆمەڵێك بەرهەمی هونەری‌و وێژەیی بەنرخ: *( a ~ of verse)* .

**treasury note,** مروانامەی دارایی (کە وەزارەتی دارایی دەریدەکات).

**treat** (trēt), *v.i.* (١) سەوداکردن؛ سەوداگەری کردن
(٢) وێرکردن؛ پارە بۆ دان.

*v.t.* (١) باسکردن؛ لێکۆڵینەوە (بە شێوەیەکی تایبەتی):
*( He ~s the subject of abortion thoroughly in his book.)*
(٢) وا دانان؛ وا سەیرکردن: *( He ~ed the mistake as a joke.)* .
(٣) رەفتار لەگەڵ کردن؛ لەگەڵ جووڵانەوە: *( He ~s his wife badly.)* .
(٤) وێرکردن *( He ~ed her to dinner.)*
(٥) دەرمانکردن؛ چارەکردن.

*n.* (١) وێر دەعوەت.
(٢) وێرکردن؛ دەعوەت کردن؛ نۆرەی وێرکردن.
*( It is my turn to ~ today.)*
(٣) خۆشی؛ شتێکی خۆش: *( It is a ~ to see the city with you.)* .

**treat of,** لێدووار؛ باسکردن؛ لێکۆڵینەوە.

**treatise** (trē′tis), *n.* (١) زانستنامە؛ نامیلکە؛ لێکۆڵینەوەی نووسراو؛ لێدووان (٢) [Obs.]، چیرۆك؛ گێرانەوە.

**treatment** (trēt′mənt), *n.* (١) رەفتار لەگەڵ کردن؛ لەگەڵ جووڵانەوە.
(٢) چارەکردن؛ دەرمانکردن؛ دەرمان؛ چارە.

**treaty** (trē′ti), *n.* (١) رێکەوتن (٢) [Obs.]، گفتوگۆ
(٣) [Obs.]، تکا؛ داوا؛ پاڕانەوە. (٤) (ا) پەیمان (نێو دەوڵەتان).
(ب) بەڵگەنامەی ئەم پەیمانە

**treble** (treb′'l), *adj.* (١) سێ ئەوەندە
(٢) تایبەت بە دەنگی هەرە بەرزی ئۆپەرا
(٣) زیل؛ بەرزو ناساز؛ تیژ (دەنگ).

*n.* (١) سۆپرانۆ؛ بەرزترین دەنگی ئۆپەرا.
(٢) گۆرانی بێژ یا ئامێری مۆسیقای ئەم دەنگە بەرزە.
(٣) دەنگی بەرزو ناساز؛ زیل؛ دەنگی تیژ.

*v.t.* کردن بە سێ ئەوەندە.

*v.i.* بوون بە سێ ئەوەندە

-**trebleness** *(n.)*; **trebly** *(adv.)*.

**trebuchet** (treb′yoo-shet′), *n. Also* **trebuket.** مەنجەنیق؛ ئامێرێکی جەنگی بەردهاوێژی کۆنە.

**trecento** (tre-chen′tô), *n.* سەدەی چواردەهەم لە هونەرو وێژەی ئیتاڵیدا.

**tree** (trē), *n.* (١) درەخت؛ دار؛ دارو درەخت
(٢) بنچك یا دەوەنی درەخت ئاسا: *( a rose ~ )* .
(٣) دار؛ دەستەك؛ کۆڵەکە؛ ستوونی دار؛ مێخ.
(٤) سێدارە. (٥) **family tree** (٦) بلووری درەخت ئاسا (کیمیا).
(٧) کورتەی ئەم وشانەیە: **christmas tree; boot tree; saddletree** .
(٨) شتێکی لە درەخت چوو: *( a clothes ~ )* .
(٩) [Archaic]، [T-]، سێدارەی عیسا.

*v.t.* (١) راڤرادنە سەر دارێك؛ پەنا پێ بردنە سەر دار (٢) پێڵاو لە قاڵب دان.
(٣) [Colloq.]، تەنگەتاو کردن؛ بەگیرهێنان؛ تەنگ پێ هەڵچنین.

**up a tree,** [Colloq.], تەنگەتاو تەنگ پێ هەڵچنراو؛ بەگیرهێنراو؛ ڕێ لێ گیراو؛ لە بارودۆخێکی شلۆقدا بوون.

**tree fern,** کەرەوزە کێویلەی گەورە؛ قژە کەنیشکی گەورە؛ دارە سەرخەس.

**tree frog,** بۆقی دار: جۆرە بۆقێکی بچووکە لەسەر دارو درەخت دەژی. (هەروەها " **tree toad** ")

**tree heath,** brier.

**tree house,** خانوچکەی سەر دار (بۆ یاری منداڵان).

**tree line,** = timberline.

**tree nail,** بزماری دار: بەڕوولە دارێکە دارو تەختەی پێ دەدرێ لەیەك (کە تەڕ بوو دەئاوسێ لەبەرئەوە لە کەشتی دروستکردندا بەکاردەهێنرێ).

**tree of heaven,** = ailanthus.

**tree of knowledge,** داری زانین: ئەو دارەی بەهەشتە کە خوا بەرەکەی لە ئادەم‌و حەوا قەدەغە کردبوو بەڵام ئەوان لێیان خواردو دەرکران لە بەهەشت (قورئان‌و ئینجیل).

**tree surgeon,** نەشتەرگەری دار: کەسێکە شارەزای دارو درەختە.

**tree surgery,** نەشتەرگەری دار: لق‌وپۆپی ووشك لێکردنەوەو جێی برینی تازە چارەکردن.

**tree toad,** = tree frog.

**treetop** (trē′top′), *n.* پۆپەی دار؛ تەوقەسەری درەخت.

**trefoil** (trē′foil), *n.* (١) سێپەڕە؛ وێنجە.
(٢) خشڵ، درووشم، یا شتی ڕازاندنەوەی تری سێپەڕە.

**trehalose** (trē′hə-lōs′), *n.* تریهالۆز: شەکرێکی بلوورییە لە هەوێن‌و قارچك‌و کەڕوو دەردەهێنرێ.

**trek** (trek), *v.i.* (١) بە گالیسکەی گا ڕۆیشتن یا ڕەوکردن.
(٢) بە هێواشی‌و بە گران ڕۆیشتن؛ خۆ بەکێش کردن؛ ڕێگە کوتان.

*v.t.* گالیسکە ڕاکێشان (گا).

*n.* (١) (ا) ڕەو بە گالیسکەی گا. (ب) قۆناغێکی ئەم ڕەوە یا گەشتە
(٢) (ا) گەشت. (ب) قۆناغ (٣) ڕەو؛ ڕەوکردن؛ کۆچ؛ کۆچی بە کۆمەڵ

-**trekker** *(n.)*.

**trellis** (trel′is), *n.* (١) کەپرۆکە؛ چوارچێوەی تەنراو بۆ پیاهەڵگەڕانی ڕووەك. (٢) کەپر؛ سابات.

*v.t.* (١) کەپرۆکە بۆ کردن. (٢) خستنە سەر یا هەڵگەڕاندن بە کەپرۆکەدا (دارەمێو و ڕووەکی خۆهەڵواس). (٣) چنین؛ وەك تەیمان لێکردن.

**trelliswork** (trel′is-wŭrk′), *n.* = latticework.

**trematode** (trem′ə-tōd′, trē′mə-tōd′), *n.* کرمێکی پانکەلەی مشەخۆرە.

**tremble** (trem′b'l), *v.i.* (١) لەرزین؛ هاتنە لەرزین؛ مووچرك پێدا هاتن؛ تەزوو پێدا هاتن. (٢) ترسان؛ تۆقین؛ زۆر مەراق بوون:
*( I ~ for your safety.)*
(٣) لەرینەوە؛ لەرەلەرکردن.

*n.* (١) لەرزین؛ گیان لەرزین؛ مووچرك؛ تەزوو؛ لەرزەلەرز؛ لەرزە.
(٢) (*pl.*)، لەرزۆکی: نەخۆشییەکی ژەهراوییە تووشی ئاژەڵ‌و ڕەشەووڵاخ دەبێت لە خواردنی گیای ژەهراوی‌و نیشانەکانی لەرزین‌و نووچدانە

**trembly** (trem′bli), *adj.* لەرزۆك.

**tremendous** (tri-men′dəs), *adj.* (١) تۆقێنەر؛ ترسناك.
(٢) (ا) زۆر زل؛ زۆر گەورە؛ مەزن: *( a ~ task)* .
(ب) [Colloq.]، زۆرباش؛ سەرئاسا؛ نایاب.

-**tremendously** *(adv.)*; **tremendousness** *(n.)*.

**tremolite** (trem′ə-līt′), *n.* تریمۆلیت: کانزایەکە لە سلیکاتی کالیسیۆم‌و مەگنیسیۆم پێکدێت.

**tremolo** (trem′ə-lō′), *n.* (١) لەرینەوە (مۆسیقا)؛ لەرە؛ لەرزە.
(٢) ئامێری لەراندنەوە (لە ئۆرگەندا).
(هەروەها " **tremolant** " ، " **tremulant** " ) .

**tremor** (trem′ẽr, trē′mẽr), *n.* (١) لەرزین؛ لەرزە:
*( He suffered from a nervous ~ .)*
(٢) (ا) لەرە؛ لەرینەوە؛ لەرەلەر. (ب) بوومەلەرزە: *( an earth ~ )*
(٣) مووچرك؛ تەزوو. (٤) وورووژان؛ بێ ئارامی.
(٥) دەنگی لەرینەوە یا لەرزین.

**tremulant, tremulent** (trem′yoo-lənt), *adj.* = tremulous.

**tremulous** (trem′yoo-ləs), *adj.* (١) لەرزۆك؛ لەرزیو؛ دەلەرێتەوە.
(٢) ترسنۆك.

-**tremulously** *(adv.)*; **tremulousness** *(n.)*.

**trench** (trench), *v.t.* (١) بڕین؛ هەڵکۆڵین. (٢) بڕینەوە؛ لێکردنەوە؛ هەڵدڕین. (٣) خەنەق تێدا هەڵکەندن؛ خەنەق لێدان.

(٢) شایەری گەڕۆك.

**trouble** (trub′′l), *v.t.* (١) تێکدان؛ وورووژاندن:
***( The waters were ~d.)***
(٢) پەستکردن: تووشی دەردی سەری کردن؛ بێزارکردن؛ مەراق پێدان؛ تووشی گێچەڵ کردن. (٣) ئازاردان.
(٤) نارەحەت کردن: ***( May I ~ you to close the window.)*** .
*v.i.* (١) هەوڵدان: گوێ دان: ***( Do not ~ about a reply.)*** .
(٢) مەراق خواردن: پەست بوون.
***n.*** (١) مەراق: ناخۆشی. (٢) گێرەوکێشە؛ گێچەڵ: گێژاو؛ دەردی سەری؛ گۆبەند؛ تەنگوچەڵەمە؛ کارەسات؛ کێشە؛ گیروگرفت.
(٣) هۆی ناخۆشی و دەردی سەری و گێرەوکێشە.
(٤) ئاژاوە: ئاشووب؛ پشێوی.
(٥) هەوڵ: گوێ دان؛ بە تەنگەوەهاتن:
***( He took the ~ to shake hands with everyone present.)***
(٦) نەخۆشی ***( heart ~ )***
(٧) ناتەواوی: پەك کەوتن؛ لەکارکەوتن: ***( We had engine ~ .)*** .
(٨) سکپڕبوون بەبێ شووکردن: ***( in ~ )*** .
**ask for trouble,** خۆ لە قەڵبەدا دان؛ سەرچڵی کردن؛ بۆ دەردەسەری گەڕان
**get into trouble,** بە قەڵبەدا دان: تووشی چەرمەسەری و کێشە کردن.
**look for trouble, = ask for trouble.**
**make trouble,** ئاژاوە نانەوە؛ گێرەشێوێنی کردن.
**troublemaker** (trub′′l-māk′ēr), *n.* گێرەشێوێن؛ ئاژاوەچی؛ سەر لە گوبەنگ
**trouble-shooter** (trub′′l-shōōt′ēr), *n.* (١) چارەسەرکەری مەکینەو دەستگای شکاو یا لەکارکەوتوو؛ دۆزەرەوەو چارەسەرکەری ناتەواوی مەکینەی لەکارکەوتوو (٢) چارەسەرکەری کێشەی دیبلۆماسی؛ چارەسەرکەری ناکۆکی و گیروگرفتی نێو وولاتان یا کۆمەڵەکان.
**troublesome** (trub′′l-səm), *adj.* (١) بێزارکەر: ماندووکەر؛ ناخۆش: پەستکەر: ***( a ~ child, headache, etc.)*** .
(٢) سەخت: گران: ئاڵۆز؛ گیروگرفتاوی.
**-troublesomely** *(adv.)*; **troublesomeness** *(n.)*.
**troublous** (trub′ləs), *adj.* (١) شێواو؛ ئاڵۆز: پشێو.
(٢) **troublesome**
**trou-de-loup** (trōō′də-lōō′), *n.* [Fr.], قوونکەی مێخی نووك تیژ تێدا چەقێنراو (بۆ ڕێ گرتن لە لەشکری سوارەی دوژمن).
**trough** (trôf), *n.* (١) ئاخوڕ. (٢) تەشت، دەفر، یا حەوزۆچکەی ئاودانی وولاخ. (٣) دەفری درێژکۆلەی شت تێدا شێلان یا شتن.
(٤) ناوەڕۆ (بەتایبەتی هی گوێ سەبانەی خانوو).
(٥) (ا) چاڵایی نێوان دوو شەپۆل.
(ب) چەم یا چاڵایی درێژکۆلەی نێوان دوو گرد.
(٦) (ا) بێ بازاڕی؛ بازاڕ کزی
(ب) خاڵی نزمی نەخشەی پیشاندەر (ژمێرەکاری).
(٧) نزمی پاڵەپەستۆی هەوا.
**trounce** (trouns), *v.t.* (١) لێدان؛ بیرازکردن: کوتان؛ فەلاقەکردن؛ دارکاری کردن (٢) [Colloq.]، بەزاندن.
**troupe** (trōōp), *n.* تیپ (نوێنەری شانۆ، گۆرانی بێژ)؛ دەستە.
*v.t.* گەڕان وەك ئەندامی تیپێکی نوێنەری شانۆ یا گۆرانی بێژ.
**trouper** (trōōp′ēr), *n.* (١) ئەندامی تیپێکی نوێنەری شانۆ.
(٢) نوێنەرێکی شانۆی کۆن و شارەزا.
**troupial** (trōōp′i-əl), *n.* چەند جۆرە باڵندەیەکی ئەمەریکی ناوچە گەرمەکانن لە توخمی ڕەشۆڵە.
**trouser** (trou′zēr), *adj.* تایبەتی بە پانتۆڵ.
**trousers** (trou′zērz), *n.pl. Also* **trowsers,** پانتۆڵ: شەرواڵ
**trousseau** (trōō-sō′, trōō-sō), *n.* جیازی: ڕەختی بووك.

**trout** (trout), *n.* ماسییە خاتوونە؛ کەشینە؛ ماسییەکی ناو ڕووبارە.
**trouvere** (trōō-vâr′), *n. Also* **trouveur,** یەکێکە لە کۆمەڵە چیرۆك بێژی باکووری فەرەنسا لە سەدەی یانزە بۆ چواردە.
**trove** (trōv), *n.* شتێکی دۆزراوەی بەنرخ: دۆزراوە.
**trover** (trō′vēr), *n.* داواکاری بۆ بژاردنی شتومەکی دەست بەسەردا گیراوی کەسێك بە نارەوایی لەلایەن کەسێکی ترەوە.
**trow** (trō, trou), *v.i. & v.t.* (١) [Obs.]، بڕواکردن.
(٢) [Archaic]، وا زانین؛ وا دانان.
**trowel** (trou′əl), *n.* (١) ماڵە (خانووکاری). (٢) بژارکەر؛ بێڵەکان.
*v.t.* (١) ماڵەکردن؛ بە ماڵە ساف و لووس کردن. (٢) هەڵکەندن بە بێڵەکان.
**troy** (troi), *adj.* بە کێشانەی " ترۆی " (ووشەی داهاتوو ببینە).
*n.* **troy weight.**
**troy weight,** کێشانەی ترۆی: بۆ کێشانی زێڕو زیوو بەردی بەنرخی تر بەکاردەهێنرێ.
**truancy** (trōō′ən-si), *n. Also* **truantry,** خۆ دزینەوە لە قوتابخانە بەبێ پرس؛ نەچوون بۆ ئیش یا خۆ دزینەوە لە ئیش بەبێ پرس.
**truant** (trōō′ənt), *n.* (١) کەسێکی تەمەڵ
(٢) قوتابی خۆ دزەرەوە بەبێ پرس؛ قوتابی نەهاتوو بۆ قوتابخانە بەبێ پرس
(٣) کەسێکی خۆ دزەرەوە لە ئیش بەبێ پرس؛ کەسێکی ڕاکردوو لە ئەرکی سەرشانی خۆی.
*adj.* (١) خۆ دزەرەوە لە قوتابخانە یا نەهاتوو بەبێ پرس.
(٢) لە ئیش دواکەوتوو بەبێ ئیش. (٣) تەمەڵ.
*v.i.* (١) خۆ دزینەوە لە قوتابخانە؛ نەچوون بۆ قوتابخانە بەبێ پرس.
(٢) خۆ لە ئیش دزینەوە؛ ڕاکردن لە ئەرکی سەرشان.
**play truant,** خۆ دزینەوە لە قوتابخانە یا لە ئیش.
**truant officer,** لێپرسراوی خۆ دزینەوەی قوتابی: فەرمانبەرێکی قوتابخانەیە لەو قوتابییانە دەپرسێتەوە کە خۆیان لە قوتابخانە دەدزنەوە بەبێ پرس
**truce** (trōōs), *n.* شەڕ ڕاگرتن؛ جەنگ وەستاندن.
**truck** (truk), *n.* (١) پێچکەی بچووکی گالیسکەی، تۆپ.
(٢) پارچە تەختەیەکی کون کونە بەسەر دارئاڵا و دارکەشتی بۆ پەت پیاکردن
(٣) لۆری. (٤) [British]، فارگۆنی سەرکراوەی شەمەندەفەری بار.
*v.t.* بە لۆری گواستنەوە؛ لە لۆری بارکردن.
*v.i.* لۆری لێخوڕین.
**truck** (truk), *v.t. & v.i.* (١) ئاڵوگۆڕکردن.
(٢) [Rare]، دەستگێڕی کردن؛ چەرچێتی کردن.
***n.*** (١) ئاڵوگۆڕ. (٢) بە شتومەك کرێدان نەك بە پارە. (٣) فرۆتەنی بچووك
(٤) شتومەکی بچووکی بێ نرخ یا هەرزان.
(٥) سەوزەی چێنراو بۆ فرۆشتن لە بازاڕدا.
(٦) [Colloq.]، ئاڵوویر؛ سەوداگەری.
(٧) [Colloq.]، زبڵ؛ پاشماوە؛ خۆڵ؛ سەرکۆزەر.
**truckage** (truk′ij), *n.* (١) بار گواستنەوە بە لۆری.
(٢) کرێی ئەم گواستنەوەیە.
**trucker** (truk′ēr), *n.* (١) لۆری لێخوڕ؛ ڕانەری لۆری. (هەروەها " **truck-driver** " ) . (٢) کارگەری بار گواستنەوە بە لۆری.
**trucker** (truk′ēr), *n.* (١) ئاڵوگۆڕکەر. (٢) دەستگێڕ؛ چەرچی.
(٣) جووتیاری سەوزەی فرۆشتن.
**truck farm,** کێڵگەی سەوزەی فرۆشتن.
**trucking** (truk′iŋ), *n.* شتومەك گواستنەوە بە لۆری.
**truckle** (truk′′l), *n.* (١) پێچکەی بچووك. (٢) **truckle bed** .
*v.i.* (١) لەسەر پێچکە ڕۆیشتن. (٢) سەر شۆڕکردن؛ ملکەچ کردن.
*v.t.* بە پێچکەی بچووك جوولاندن.
**-truckler** *(n.)*.
**truckle bed,** چەرپایەیەکی نزمە لەسەر پێچکەی بچووکە دەخرێتە ژێر چەرپایەیەکی ترەوە لەکاتی بەکارنەهێناندا (هەروەها " **trundle bed** " ) .

**truckload** (truk′lōd′), *adj.* پڕ لۆرییەك؛ زۆر.
**truckman** (truk′mən), *n.* trucker.
**truculence** (truk′yoo-ləns, trōō′kyoo-ləns), *n. Also* **truculency,** (١) دڕندەیی؛ بێ بەزەیەتی. (٢) توندوتیژی؛ شەڕەنگێزی.
**truculent** (truk′yoo-lənt, trōō′kyoo-lənt), *adj.* (١) دڕندە؛ بێ بەزەیی. (٢) زۆر توندوتیژ؛ بڕ (ووتار). (٣) شەڕەنگێز؛ شەڕانی.
**-truculently** *(adv.).*
**trudge** (truj), *v.i.* خۆ بەکێش کردن؛ بە گران ڕۆیشتن
*( He ~d ten miles through the snow.)*
*n.* ڕۆیشتنێکی دوورو درێژو ماندووکەر؛ ڕۆیشتنێکی گران
**true** (trōō), *adj.* (١) دڵسۆز: *( He is ~ to his friends.)*.
(٢) تەواو؛ پشت پێ بەستراو؛ ڕاست: *( a ~ indication)*.
(٣) ڕاست؛ درۆی تێدا نییە؛ ڕاستەقینە. *( a ~ story)*.
(٤) ڕاستگۆ. (٥) دەقاودەق؛ تەواو؛ بەبێ کەمو زیاد: *( a ~ copy)*.
(٦) ڕەوا؛ ڕاستی *( the ~ owner, heir, etc.)*
(٧) لە بری خۆیەتی؛ ڕاست دانراوە: *( The board is not ~ .)*.
(٨) (ا) تەواو؛ ڕەسەن؛ ڕاستەقینە: *( a ~ diamond)*
(ب) ڕاستەقینە؛ تەواو؛ ڕاست *( a ~ scholar)*.
(٩) [Archaic]، پاك؛ داوێن پاك؛ ڕاست؛ سەرڕاست.
(١٠) ڕەسەن
*adv.* (١) بە ڕاستی؛ بە تەواوی. (٢) ڕەسەنانە.
(٣) بە وردی؛ بێ کەمو زیاد *( He aimed ~ .)*.
*v.t.* **( ~ up ),** سازاندن؛ چاك کردن؛ ڕاستکردنەوە: *( to ~ up a wheel)*.
*n.* (١) ڕاستی. (٢) ڕێکی؛ ڕێكو ڕاستی: *( in ~ ; out of ~ )*.
**-trueness** *(n.).*
**come true,** هاتنەدی
**true bill,** بڕیاری تاوانبارکردن لەلایەن دەستەی سوێندخۆرانی گەورەوەو دان بە دادگا بۆ لێپرسینەوە
**true-blue** (trōō′blōō′), *adj.* زۆر دڵسۆز (بەتایبەتی بۆ حیزب یا ئاین)
**true blue,** (١) ڕەنگی شینی نەچووەوە. (٢) کەسێکی زۆر دڵسۆز (٣) زۆر دڵسۆزی. (ووشەی پێشوو ببینە).
**trueborn** (trōō′bôrn′), *adj.* ڕەسەن *( a ~ Kurd)*.
**truebred** (trōō′bred′), *adj.* (١) ڕەسەن. (٢) ڕەفتار جوان
**true-false test,** تاقیکردنەوەی ڕاست یا هەڵە: تاقیکردنەوەیەکە قوتابی دەستنیشانی دەکات وەڵامەکان کامیان ڕاستن و کامیان هەڵەن.
**truehearted** (trōō′här′tid), *adj.* دڵسۆز؛ پاك
**truelove** (trōō′luv′), *n.* (١) دلدار؛ یار؛ خۆشەویست
(٢) گیایەکە چوار گەڵاو گوڵێك دەگرێ لە " گرێی دلداران " دەچێ.
(٣) [Obs.]، truelove knot.
**truelove knot,** گرێی دلداران (کە بە گران دەکرێتەوەو نیشانەی خۆشەویستی هەمیشەییە)
**true-lover's knot,** = truelove knot.
**truepenny** (trōō′pen′i), *n.* کەسێکی پاكو دڵسۆزو سەرڕاست
**truffle** (truf′'l, trōō′f'l), *n.* دوومەڵان
**truism** (trōō′iz'm), *n.* ڕاستییەکی نەگەنەویست؛ ڕاستییەکی دیار
**trull** (trul), *n.* قەحبە؛ ئافرەتی سووك
**truly** (trōō′li), *adv.* (١) بە ڕاستی؛ بە دڵ *( I'm ~ grateful.)*.
(٢) ڕاستگۆیانە؛ بەبێ درۆ؛ بە ڕاستی؛ بێ زیادو کەم *( He spoke ~ .)*.
(٣) بێ گومان؛ بە ڕاستی: *( This is a ~ beautiful picture.)*.
**trump** (trump), *n.* (١) (ا) کاغەزی براوەی قومار؛ ئەو کاغەزەی نرخی لە هەموو ئەوانی تر زیاترە. (ب) *(pl.)*، پێزێکی ئەم کاغەزانە
(٢) شتێك بە دەست کەسێکەوە کە لە باشترین هەلدا بەکاری دەهێنێ بۆ ئەوەی سوود لێ وەرگرتن
(٣) [Colloq.]، کەسێکی باش و پشت پێ بەستراو
*v.t.* (١) بردنەوەی دەستێك قومار بە کاغەزی براوە.
(٢) لێ بردنەوە؛ بەسەردا سەرکەوتن.
*v.i.* کاغەزی براوە بەکارهێنان؛ دەستی باش بەکارهێنان (مەجاز).
**trump up,** هەڵبەستن (درۆ، بوختان)؛ ڕێکخستن؛ درووستکردن:
*( to trump up charges against somebody)*
**trump** (trump), *n., v.t. & v.i.* = **trumpet.**
**trump card,** (١) کاغەزی براوەی قومار. (ووشەی پێشوتر ببینە).
(٢) شتێکی زۆر بەنرخە کە لە هەلێکی باشدا بەکاردەهێنرێ بۆ زۆرترین سوود لە بردنەوەی بەربەرەکانێدا:
*( The surprise witness was his ~ .; She played her ~ .)*
**trumpery** (trum′pēr-i), *n.* (١) شتی بریقەدارو هەرزانبەها.
(٢) شتی بێ نرخ یا هیچ‌وپووچ. (٣) قسەی هیچ‌وپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ مانا
**trumpet** (trum′pit), *n.* (١) کەڕەنا؛ زوڕنا. (٢) کەڕەناژەن؛ زوڕناژەن.
(٣) شتێکی لە کەڕەنا چوو. (٤) *(pl.)*، ڕووەکێکە گەڵاکانی لە کەڕەنا دەچن.
(٥) دەنگێکی وەك دەنگی کەڕەنا (بەتایبەتی دەنگی فیل).
*v.i.* (١) کەڕەنا لێدان؛ فووکردن بە کەڕەنا یا زوڕنادا.
(٢) بۆڕاندن؛ دەنگێکی وەك دەنگی کەڕەنا لێوەهاتن.
*v.t.* (١) زوڕنا لێدان؛ کەڕەنا لێدان. (٢) بۆڕاندن؛ هاوارکردن.
(٣) بانگ بۆ دان؛ جاڕ بۆ دان
**trumpet creeper,** خشۆکە زوڕنایی: ڕووەکێکی خۆهەڵواسە گوڵەکەی لە زوڕنا دەچێت.
**trumpeter** (trum′pit-ēr), *n.* (١) زوڕناژەن؛ کەڕەناژەن.
(٢) سەربازی کەڕەناژەن. (٣) جاڕچی؛ بانگدەر.
(٤) باڵندەیەکی ملو لاق درێژی ئەمەریکای باشوورە بە دەنگی بەرز دەخوێنێت
(٥) **trumpeter swan** . (٦) کۆتری پەڕلەپێ.
**trumpeter swan,** قازێکی ئەمەریکای باکوورە بە دەنگی بەرز دەخوێنێت.
**trumpet flower,** (١) ڕووەکی گوڵ زوڕنایی. (٢) گوڵە زوڕنا.
**trumpet honeysuckle,** پەنجەی خانمی زوڕنایی.
**trumpetlike** (trum′pit-līk′), *adj.* زوڕنایی؛ لە زوڕنا دەچێت بە دەنگ یا بە شێوە.
**trumpet vine,** = **trumpet creeper.**
**truncate** (truŋ′kāt), *v.t.* قرتاندن؛ بڕین؛ قەڵەم کردن؛ کورتکردنەوە؛ پەڕاندن (کلك).
*adj.* (١) قرتاو؛ قرتێنراو؛ قەڵەم کراو؛ کورتکراوە.
(٢) کۆڵ؛ نووك پان؛ سەر پان (گەڵا).
**-truncately** *(adv.)*; **truncation** *(n.).*
**truncated** (truŋ′kāt-id), *adj.* (١) قرتاو؛ قرتێنراو؛ قەڵەم کراو؛ کورتکراوە. (٢) سەر قرتێنراو (قووچەك یا شێوەی ئەندازەیی تر)؛ ڕێك کراو؛ ساف کراو؛ تەخت.
**truncheon** (trun′chən), *n.* (١) دار؛ گورز؛ لیس.
(٢) داری دەسەڵاتداری (وەك هی پۆلیس و ئەفسەر).
(٣) [Archaic]، قەفی ڕم یا نێزە.
(٤) [Obs.]، قەدی داری ڕووت کراو.
*v.t.* دارکاری کردن؛ بە دار لێدان.
**trundle** (trun′d'l), *n.* (١) پێچکەی بچووك
(٢) عەرەبانەی نزمی پێچکە بچووك. (٣) **trundle bed** .
(٤) (ا) خولانەوە؛ خل بوونەوە. (ب) دەنگی خولانەوە یا خل بوونەوە.
*v.t. & v.i.* (١) خولانەوە؛ خل بوونەوە. (٢) سووڕانەوە.
**trundle bed,** = **truckle bed.**
**trunk** (truŋk), *n.* (١) قەد (دارو درەخت)
(٢) قەدی مرۆڤ؛ لەشی مرۆڤ یا گیاندار جگە لە سەرو پەلەکانی: تەنگە
(٣) بەشی سەرەکی بۆری خوێن و هەستە دەمار. (٤) لمۆز (فیل)
(٥) باوول؛ باوەڵ. (٦) بۆری ئاوو هەوا... هتد. (٧) *(pl.)*، **trunk hose**
(٨) *(pl.)*، پانتۆڵی کورتی پیاوانەی وەرزش. (٩) **trunk line**

(١٠) تەفەزەی سنگی جانەوەر. (١١) سنووقی ئوتومبیل.
(١٢) قەدی پایەو کۆڵەکە.
*adj.* هی هێڵی سەرەکی شەمەندەفەر یا تەلەفۆن.
**trunkfish** (truŋk′fish′), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی قاوغداری وەك سنووقی ناوچە گەرمەکانە. (پێشی دەووترێ: " boxfish ").
**trunk hose,** پانتۆڵی کورتی دەڵبی پیاوانە (هی سەدەی شانزەو حەڤدە).
**trunk line,** هێڵی سەرەکی شەمەندەفەرو تەلەفۆن؛ جۆگەی سەرەکی.
**trunnel** (trun′l), *n.* = treenail.
**trunnion** (trun′yən), *n.* تەوەرەی تۆپ؛ جێی سووڕانەوە.
**truss** (trus), *v.t.* (١) پێچانەوە (پرپاسکە).
(٢) (ا) [Rare]، جل لەبەرکردن؛ وەك مەلۆتکە پێچانەوە.
(ب) جل توندکردنەوە یا قایم کردن؛ جل گرێدان.
(٣) باڵ و لاقی باڵندە لە شیش دان یا بەستنەوە پێش کوڵاندنی.
(٤) جەمەلۆن کردن؛ چوارچێوە دانە بەر (پرد، سەربان).
*n.* (١) پرپاسکە؛ بەند؛ بەستەك. (٢) گوورزە (گرزە).
(٣) بەندی ئاسنی دەووری دارکەشتی. (٤) گۆشە (خانووکاری).
(٥) تۆپەڵە گوڵێکی چڕ بەسەر لاسکێکەوە.
(٦) چوارچێوەی سەربان یا پرد؛ جەمەلۆن. (٧) پشتێنی قوڕی.
**truss bridge,** پردی لەسەر چوارچێوە یا پایە ڕاوەستاو؛ پردی جەمەلۆنی.
**trust** (trust), *n.* (١) باوەڕ؛ متمانە؛ پشت پێ بەستن.
(٢) کەسێك یا شتێکی پشت پێ بەستراو؛ کەسێکی متمانە پێکراو.
(٣) ئومێدەواری؛ ئومێد؛ هیواداری؛ هیوا: *( Have ~ in the future.)*.
(٤) [Rare]، جێی بڕوابوون؛ دڵسۆزی.
(٥) (ا) شت خرانە ئەستۆ؛ پشت پێ بەستران. (ب) بەرپرسیاری.
(٦) چاودێری. (٧) سپاردە.
(٨) قەرز *( He sells on ~.)*
(٩) یەکێتی چەند کۆمپانیایەکە بۆ بەربەرەکانی نەهێشتن؛ قۆرخ؛ کارتێل.
(١٠) (ا) زەوی‌وزارو خانووی کەسێکی بێ دەسەڵات یا کەفتەکار یا منداڵێك سپاردن بە کەسێکی تر بۆ چاودێری کردنی. (ب) متمانەی ئەم پێ سپاردنە.
(ج) پێ سپێردراو؛ چەند پێ سپێردراوێك (د) مافی ئەو کەسەی خانوو و زەوی‌وزارەکەی سپێردراوە بە کەسێکی تر بۆ چاودێری کردنی.
*v.i.* (١) متمانە پێکردن؛ پشت پێ بەستن؛ باوەڕپێکردن.
(٢) هیوا بوون؛ ئومێدەوار بوون. (٣) قەرز پێدان (لەبەر متمانە پێکردن).
*v.t.* (١) متمانە پێکردن؛ پشت پێ بەستن؛ باوەڕ پێ بوون. (٢) پێ سپاردن.
(٣) پێ ڕایەرموون. (٤) وا زانین؛ وا دانان. (٥) ئومێدەوار بوون؛ هیوادار بوون.
(٦) قەرز پێدان (لەبەر متمانە پێکردن).
*adj.* سپێردراو؛ سپاردە؛ لەژێر چاودێری کەسێکی تردایە.
**in trust,** سپێردراوە بە کەسێکی تر بۆ چاودێری کردنی.
**trust to,** پشت پێ بەستن.
**trust company,** بانقی سپاردە
**trustee** (trus-tē′), *n.* (١) پێ سپێردراو؛ کەسێکە خانوو و زەوی‌وزاری کەسێکی تری پێ دەسپێردرێ.
(٢) ئەندامی دەستەی پێ سپێردراوی دانشگایەك یا نەخۆشخانەیەك.
(٣) کەسێکە خانوو و زەوی‌وزاری قەرزارێکی پێ دەسپێردرێ تا دانەوەی قەرزەکە.
*v.t.* (١) پێ سپاردنی خانوو و زەوی‌وزار بۆ چاودێری کردن.
(٢) پێ سپاردنی خانوو و زەوی‌وزارو سامانی قەرزارێك تا دانەوەی قەرزەکە.
**trusteeship** (trus-tē′ship), *n.* (١) ئیش‌وکاری پێ سپێردراو.
(٢) پێ سپاردنی وڵاتێك یا هەرێمێك بە وڵاتێکی تر لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بۆ چاودێری کردنی.
(٣) وڵاتێك یا هەرێمێکی وەها سپێردراو.
**trustful** (trust′fəl), *adj.* خۆش باوەڕ؛ بە هەموو کەس باوەڕکەر.
-trustfully *(adv.)*; trustfulness *(n.)*.
**trust fund,** سەرمایەی سپاردە؛ پارەو سەرمایەی تری کەسێکە
ئەسپێردرێ بە کەسێکی تر یا بانقێك بۆ هەڵگرتن و چاودێری کردنی
**trusting** (trus′tiŋ), *adj.* خۆش باوەڕ؛ بە هەموو کەس باوەڕکەر.
**trustless** (trust′lis), *adj.* (١) جێی باوەڕ نییە؛ متمانە پێ نەکراو؛ پشت پێ نەبەستراو. (٢) بێ بڕوا؛ بە هەموو کەس باوەڕنەکەر؛ بە گومان.
**trust territory,** ناوچەیەکی سپێردراوە بە وڵاتێك لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بۆ چاودێری کردنی؛ ناوچەی ژێردەستەی کۆمەڵەی نەتەوەیەکگرتووەکان.
**trustworthiness** (trust′wûr′thi-nis), *n.* جێی باوەڕ بوون؛ پشت پێ بەستران؛ متمانە پێ کران.
**trustworthy** (trust′wûr′thi), *adj.* پشت پێ بەستراو؛ متمانەی پێ دەکرێ؛ جێی باوەڕە؛ سەرڕاست.
-trustworthily *(adv.)*.
**trusty** (trus′ti), *adj.* (١) [Rare]، خۆش باوەڕ.
(٢) پشت پێ بەستراو؛ متمانە پێکراو؛ جێی بڕوایە.
*n.* (١) کەسێکی متمانە پێکراو؛ کەسێکی پشت پێ بەستراو.
(٢) بەندێکە هەندێ مافی تایبەتی دەدرێتێ لە بەندیخانەدا لەبەر ڕەووشتی باش.
-trustily *(adv.)*; trustiness *(n.)*.
**truth** (trooth), *n.* (١) (ا) جێی بڕوا بوون. (ب) دڵسۆزی؛ پاکی.
(٢) ڕاستی. (٣) ڕاستاڵی؛ ڕاستگۆیی. (٤) ڕاستی‌یەك؛ شتێکی ڕاست
**in truth,** بە ڕاستی؛ بێ گومان؛ لە ڕاستیدا؛ ئەوی ڕاست بێ.
**truthful** (trooth′fəl), *adj.* (١) ڕاستگۆ؛ ڕاستبێژ؛ ڕاستاڵ؛ ڕاست.
(٢) ڕاست؛ لەگەڵ ڕاستیدا دەگونجێ؛ هەڵنەبەستراو.
-truthfully *(adv.)*; truthfulness *(n.)*.
**try** (trī), *v.t.* (١) جیاکردنەوە. (٢) (ا) تواندنەوە (کەرە، ڕۆن).
(ب) ( ~ out )، پوختەکردن بە گەرمی (کانزا)؛ پاك کردنەوە؛ دەرهێنان.
(٣) [Now Rare]، بۆربۆڕێن لەسەر کردن؛ بڕینەوەی ناکۆکی‌یەك بە زۆرانبازی.
(٤) (ا) دان بە دادگا؛ بڕیاردانی داوایەك لە دادگادا.
(ب) بڕیاری تاوانباری یا بێ تاوانی کەسێك دان لە دادگادا.
(ج) دادپرسین؛ دادپرسی کردن؛ دادگەری کردن. (٥) تاقیکردنەوە
(٦) ڕەندەکردن؛ بە ڕەندە ساف و لووس کردن.
(٧) تاقیکردنەوەیەکی سەخت کردن: *( They ~ your patience.)*
(٨) بەکارهێنان بۆ تاقیکردنەوە؛ تاقیکردنەوە: *( T~ this new recipe.)*.
(٩) کۆشش کردن؛ هەوڵدان؛ تێکۆشان.
(١٠) [Obs.]، سەلماندن؛ ساغ کردنەوە؛ چەسپاندن.
*v.i.* (١) هەوڵدان؛ کۆشش کردن: *( Please ~ and behave.)*.
(٢) تاقیکردنەوە.
*n.* (١) هەوڵ؛ کۆشش؛ هەوڵدان؛ تێکۆشان. (٢) گۆڵ کردن (یاری ڕەگبی).
**try on,** تاقیکردنەوە (جل‌وبەرگ، پێڵاو): *( Try this shirt on.)*.
**try out,** (١) بە ووردی تاقیکردنەوە:
*( The idea seems good but it needs to be tried out.)*
(٢) تاقیکردنەوەی لێهاتوویی (نوێنەری شانۆو سینەما، وەرزشکار... هتد).
**trying** (trī′iŋ), *adj.* سەخت؛ گران؛ قورس؛ ماندووکەر؛ ناخۆش:
*( a ~ time, day, experience, etc.; work that is ~ to the eyes)*
**trying plane,** ڕەندە (دارتاشی).
**tryout** (trī′out′), *n.* [Colloq.], تاقیکردنەوەی لێهاتوویی (نوێنەری شانۆو سینەما، وەرزشکار... هتد).
**trypanosome** (trip′ə-nə-sōm′), *n.* *Also* trypanosoma, گیانداری کونکەر؛ جانەوەرێکی بە چاو نەبینراوی مشەخۆرە لە خوێنی مرۆڤ و گیاندارە بڕبڕەدارەکانی تردا دەژی و دەبێتە هۆی نەخۆشی نووستوویی.
**trypanosomiasis** (trip′ə-nō′sō-mī′ə-sis), *n.* نەخۆشی تووش بوو لە گیانداری کونکەرەوە. (ووشەی پێشوو ببینە)
**trypsin** (trip′sin), *n.* تریپسین: ئەنزیمێکە پەنکریاس دەریدەدات (یارمەتی هەرس کردنی پرۆتین دەدات).
-tryptic *(adj.)*.
**tryptophan** (trip′tə-fan′), *n.* *Also* tryptophane, تریپتۆفان:

ترشێکی نەمینی بلووریە.

**trysail** (trī′s'l, trī′sāl′), *n.* بایەوانی ڕێبان. بایەوانێکی تۆکمەی بچووکە لەکاتی زریاندا هەڵدەکرێت

**try square,** گۆشەی دارتاش.

**tryst** (trist, trīst), *n.* (١) ژوان؛ دیدەنی دلداران

(٢) ژوانگە؛ شوێنی بەیەك گەیشتن. (٣) [.Scot]، بازاڕ.

*v.i.* چوونە ژوانێك؛ بەیەکگەیشتن لە جێگەیەکی دیاریکراودا.

**trysting place,** ژوانگە؛ شوێنی بەیەك گەیشتن.

**tsar** (tsär), *n.* = czar.

**tsarism** (tsär′iz'm), *n.* = czarism.

**tsetse** (tset′si), *n. Also* **tsetse fly,** تسیتسی. مێشی نەخۆشی نوستووی

**T-shirt** (tē′shūrt′), *n.* فانیلەی نیوقۆڵی ژێرەوە.

**tsp.,** = (1) teaspoon. (2) teaspoonful.

**T square,** ڕاستەی وەك " T "

**tub** (tub), *n.* (١) (ا) تەشت؛ دەفرێکی دارینی وەك تەشت (بۆ شت تێکردن یا تیا شتنەوە). (ب) پڕ تەشتێك یا دەفرێکی وەها. (ج) شتی ناو ئەم دەفرە.

(٢) بەرمیلی بچووك؛ کەمۆڵە. (٣) (ا) سەتڵی کانزای خاو گواستنەوە لە کاندا.

(ب) عەرەبانەی خەڵووز (لە کانە خەڵووزدا). (٤) bathtub

(٥) [British Colloq.]، خۆشتنی ناو بانیۆ.

(٦) [Colloq.]، بەلەم یا کەشتییەکی پان و هێواش و ناقۆڵا؛ کەسێکی پان و یۆڕ یا خڕین.

*v.t.* (١) لە تەشتدا شتن؛ شۆردن لە دەفرێکی وەك تەشتدا.

(٢) هەڵگرتن لە کەمۆڵە یا بەرمیلێکی بچووکدا.

*v.i.* خۆشتن لە بانیۆدا

**tuba** (tōō′bə, tū′bə), *n.* تووبە. جۆرە کەرەنا یا زوڕنایەکی گەورەیە.

**tubal** (tōō′b'l, tū′b'l), *adj.* تایبەت بە بۆری (بەتایبەتی بۆری فالوبی)؛ لوولەیی.

**tubate** (tōō′bāt, tū′bāt), *adj.* وەك بۆری وایە؛ لوولەیی.

**tubby** (tub′i), *adj.* (١) لە بیپ یا بەرمیل دەچێ؛ کەمۆڵەیی.

(٢) پان و یۆڕ؛ خڕین؛ قەڵەو.

**tube** (tōōb, tūb), *n.* (١) بۆری؛ لوولە. (٢) دەفری لوولەیی.

(٣) بۆریچکە؛ ئەندام یا ئامێری لە بۆری چوو (وەك بۆری هەناسەدان):

*( bronchial ~ )*

(٤) بۆری ئەلەکترۆنی.

(٥) (ا) تونێلی شەمەندەفەری کارەبا. (ب) [Colloq.]، ئەم هێڵی ئاسنە.

(٦) [Archaic]، telescope.

(٧) جووب. تایەی ئوتومبیل... هتد).

**tubeless tire,** تایەی بێ جووب

**tuber** (tōō′bēr, tū′bēr), *n.* (١) سەڵك؛ سەلکی گۆزیکەدار (پەتاتە).

(٢) tubercle

**tubercle** (tōō′bēr-k'l, tū′bēr-k'l), *n.* (١) گۆزیکە (پەتاتە)؛ قۆرت؛ ئاوساوی؛ گرێ (ڕووەکناسی)

(٢) (ا) قۆرت (وەك هی ئێسقان)؛ گرێ؛ ئاوساوی. (ب) لوو (نەخۆشی سیل).

**tubercle bacillus,** باسیلی سیل؛ میکرۆبی سیل (کە لە چیلکە یا دار دەچێت.

**tubercular** (tōō-būr′kyoo-lēr, tū-būr′kyoo-lēr, tə-būr′-kyoo-lēr), *adj.* (١) سیلاوی؛ تایبەت بە سیل؛ دەردەبارێکەیی؛ سیلدار؛ وەك سیل. (٢) سیل؛ دەردەبارێکە.

*n.* کەسێکی سیلاوی؛ کەسێکی سیلدار.

**tuberculate** (tōō-būr′kyoo-lit, tū-būr′kyoo-lāt′, tə-būr′kyoo-lit), *adj. Also* **tuberculated,** (١) لوواوی؛ لوو تێهاتوو

(٢) سیلاوی؛ سیلدار؛ تایبەت بە سیل.

**-tuberculation** *(n.).*

**tuberculin** (tōō-būr′kyoo-lin, tū-būr′kyoo-lin, tə-būr′-kyoo-lin), *n.* دەرمانی کوتانی نەخۆشی سیل.

**tuberculo-** (tōō-būr′kyoo-lō, tū-būr′kyoo-lō, tə-būr′-kyoo-lō), *Also* **tubercul-**, پێشگرێکە بەمانای: (١) **tuberculous**. (٢) **tubercle bacillus**. (٣) **tuberculosis**.

**tuberculoid** (tōō-būr′kyoo-loid′, tū-būr′kyoo-loid′, tə-būr′kyoo-loid′), *adj.* سیلی؛ لە سیل دەچێ.

**tuberculosis** (tōō-būr′kyoo-lō′sis, tū-būr′kyoo-lō′sis, tə-būr′kyoo-lō′sis), *n.* سیل؛ دەردەبارێکە.

**tuberculous** (tōō-būr′kyoo-ləs, tū-būr′kyoo-ləs, tə-būr′kyoo-ləs), *adj.* (١) سیلاوی؛ سیلدار

(٢) لە سیل دەچێ؛ تایبەت بە سیل؛ لوودار؛ ئاوساو؛ گرێدار.

**tuberose** (tōōb′rōz′, tūb′rōz′), *n.* ڕووەکێکی مەکسیکییە ڕەگەکەی سەلکییەو گەڵاکەی وەك گیاو گوڵەکەی سپی و بۆن خۆش و وەك ڕەحەتییە.

**tuberosity** (tōō′bə-ros′ə-ti, tū′bə-ros′ə-ti), *n.* قۆرت (ئێسقان)؛ سەری خڕو ئەستووری ئێسقان.

**tuberous** (tōō′bēr-əs, tū′bēr-əs), *adj.* (١) گرێ گرێ؛ گرێدار؛ قۆرتاوی. (٢) (ا) سەلکاوی؛ سەلکی لێ پەیدا دەبێت.

(ب) لە سەڵك دەچێ؛ سەلکی. *( a ~ root)*.

**tuberous root,** ڕەگی سەلکی؛ ڕەگی وەك سەڵك.

**tubing** (tōōb′iŋ, tūb′iŋ), *n.* (١) بۆری دروستکردن؛ لوولە دروستکردن. (٢) چەند بۆرییەکی تێکهەڵکێشراو.

(٣) بۆری بەگشتی؛ بۆری. (٤) شتی لوولەیی؛ شتی وەك بۆری.

(٥) پارچە بۆری.

**tubular** (tōō′byoo-lēr, tū′byoo-lēr), *adj.* (١) وەك بۆری؛ لە بۆری دەچێ؛ لوولەیی. (٢) بە بۆری دروستکراو.

(٣) وەك دەنگی فووکردنە بە بۆریدا.

**tubulate** (tōō′byoo-lāt, tū′byoo-lāt), *adj.* (١) لە بۆری دەچێ؛ وەك بۆری؛ لوولەیی. (٢) بۆریدار؛ لوولەدار.

*v.t.* (١) وەك بۆری لێکردن. (٢) بۆری تێخستن.

**-tubulation** *(n.).*

**tubule** (tōō′būl, tū′būl), *n.* بۆریچکە؛ بۆری بچکۆلە (گیانەوەرناسی).

**tubuli-** (tōō′byoo-li, tū′byoo-lə), پێشگرێکە بەمانای: بۆریچکە.

**tubuliferous** (tū′byoo-lə-fēr′əs), *adj.* بۆریدار؛ لوولەدار؛ لە بۆری پێکهاتوو.

**tubuliflorous** (tōō′byoo-lə-flôr′əs, tū′byoo-lə-flō′rəs), *adj.* پەڕەی گوڵ وەك بۆری.

**tubulous** (tōō′byoo-ləs, tū′byoo-ləs), *adj.* (١) **tubular**.

(٢) گوڵ وەك بۆری.

**tubulure** (tōō′byoo-lyoor, tū′byoo-lyoor), *n.* دەمی بۆری خوار؛ دەمی بۆرییەکی کورت.

**tuck** (tuk), *v.t.* (١) چرچ و لۆچ تێخستن بۆ جوانی (جل دوورین)؛ قەدکردن.

(٢) ( in ~ )، خستنە ناو (چمکی کراس یا بەتانیەو چەرچەف)؛ هەڵکردن:

*( T~ in your shirt.)*

(٣) (ا) هەڵگرتن (بەتایبەتی لە شوێنێکی نادیاردا)؛ شاردنەوە:

*( a cottage ~ed away in the hill)*

(ب) خستنە باخەڵ؛ هەڵگرتن: *( He ~ed the letter into his pocket.)*

(ج) پێچانەوە؛ کۆکردنەوەو خستنە ژێر یا ناو:

*( The bird ~ed its head under its wing.)*

(٤) داپۆشین؛ خستنە ناو جێگەوەو داپۆشین:

*( She ~ed the child in bed.)*

*v.i.* (١) هێنانەوەیەك؛ گردکردنەوە.

(٢) چرچ و لۆچ تێخستن بۆ جوانی؛ قەدکردن؛ هەڵکردن.

*n.* (١) چرچ و لۆچی جل (کە بۆ جوانی تێیدا دەدووری)؛ قەد؛ توێ.

(٢) ژێری پشتەوەی کەشتی (کە جەمسەری دارو نیرگەکانی کەشتییەکەیە؛

(٢) [British Slang]، خواردەمەنی.
**tuck away** ( or **in** ), [British Slang]. ماشینەوە؛ زۆر خواردن.
**tuck** (tuk), *n.* [Archaic], شیری تەنك؛ شمشێری تەنك.
**tuck** (tuk, to͝ok), *v.t.* [Scot.], لێدان (بەتایبەتی تەپل)؛ تەقە لێ هەڵسان.
*n.* لێدان؛ تەقە
**tucker** (tuk′ēr), *n.* (١) پارچە مەکینەیەکی جل دوورینە بۆ چرچ ولۆچ کردنە حلەوە بۆ جوانی. (٢) پەخەی نەخشێنراوی کراسی ژنانە.
**tucker** (tuk′ēr), *v.t.* [Colloq.], ( ~ **out** ). ماندووکردن؛ هیلاك کردن.
**tucket** (tuk′it), *n.* [Archaic], دەنگی کەرەنا یا زورنا.
**-tude** (to͞od, tūd), پاشگرێکە بەمانای: بوون؛ چۆنێتی؛ – ی: *( certitude)*
**Tudor** (to͞o′dēr, tū′dēr), *n.* (١) بنەماڵەی تیۆدۆر (کە حوکمڕانی ئینگلتەرەیان کرد لە ساڵی ١٤٨٥-١٦٠٣). (٢) تیۆدۆر: پاشای تیۆدۆری.
(٢) هونەر یا هونەرمەندێکی چەرخی تیۆدۆر لە ئینگلتەرە.
*adj.* (١) تیۆدۆری؛ تیۆدۆر؛ لە بنەماڵەی تیۆدۆری ئینگلیزییە.
(٢) (ا) تیۆدوری: شێوازێکی خانووسازییە *( T~ architecture)* .
(ب) تیۆدۆری تایبەتی بە چەرخی حوکمڕانی تیۆدۆر: *( T~ verse)* .
**Tuesday** (to͞oz′di, tūz′di), *n. Abbr.* Tue(s)., سێ شەممە
**tufa** (to͞o′fə, tū′fə), *n.* (١) توفە: بەردەگەچێکی کون کونە. (٢) tuff
**tuff** (tuf), *n.* توف بەردێکی ئاگرپژێنی کون کونە.
**tuft** (tuft), *n.* (١) کاکۆڵ؛ گێسوو؛ گودلە؛ تیتك؛ پەلە گیا؛ تۆپەڵە موو یا پەڕ؛ پڕی گوڵە گەنمەشامی. (٢) ڕیشوو.
(٣) بێتە؛ پەلە دارو دەوەنی چڕ. (٤) goatee .
*v.t.* بە ڕیشوو ڕازاندنەوە.
*v.i.* بە کۆمەڵ ڕووان؛ بە چڕی ڕووان.
**tug** (tug), *v.i.* (١) ڕەنجدان؛ کۆشش کردن؛ ئیشکردن؛ هەوڵدان.
(٢) حەمات کردن؛ تێکۆشان.
(٣) ( ~ **at** ). توند ڕاکێشان؛ بە قایم ڕاکێشان:
*( She ~ged at her boots.)*
*v.t.* (١) توند ڕاکێشان؛ بە زۆر ڕاکێشان؛ بەکێش کردن؛ تەکان پێدان.
(٢) ڕاکێشان. (٣) ڕاکێشان بە بەلەمی ڕاکێشان.
*n.* (١) ڕاکێشانێکی توند.
(٢) (ا) کێش مەکێش؛ ململانێ؛ زۆرانبازی (مەجان):
*( a ~ between loyalty and desire)*
(ب) کۆششێکی زۆر؛ هەوڵێکی زۆر.
(٣) گوریس. زنجیر. یا قایشی ڕاکێشان (بەتایبەتی قایشی ئەسپ بەستن بە گالیسکەوە بۆ ڕاکێشانی). (٤) tugboat
**-tugger** *(n.).*
**tugboat** (tug′bōt′), *n.* بەلەمی ڕاکێشان.
(هەروەها " **towboat** " ).
**tug of war,** (١) گوریس کێشەکێ.
(٢) کێش مەکێش؛ زۆرانبازی (مەجان)؛ ململانێ.
**tuille** (twēl), *n.* زرێی ڕان
**tuition** (to͞o-ish′ən, tū-ish′ən), *n.* (١) [Archaic] ، پاسەوانی؛ چاودێری؛ سپاردە. (٢) فێرکردن (٣) کرێی فێرکردن؛ کرێی قوتابخانە.
(هەروەها " **tuition fee** " )
**-tuitional; tuitionary** *(adj.).*
**tularemia, tularaemia** (to͞o′lə-rē′mi-ə), *n.* تولاریمیە تای کەروێشك: درمێکە لە گیانداری کرۆژەندەوە (بەتایبەتی کەروێشك) دادەکەوێت و بە مرۆڤ دەگات. (هەروەها " **rabbit fever** " ) .
**tule** (to͞o′le), *n.* جۆرێکە لە زەل.
**tulip** (to͞o′lip, tū′ləp), *n.* هەڵاڵە: گوڵاڵە سوورە؛ چارەچەقیلە.
**tulip tree,** جۆرە درەختێکە گوڵی وەك هەڵاڵە دەگرێ
**tulip wood,** داری درەختێکە گوڵی وەك هەڵاڵە دەگرێ.
**tulle** (to͞ol), *n.* جۆرە ئاوریشمێکی تەنکە (پەچەو سرکەیی لێ دروست دەکرێ).
**tullibee** (tul′ə-bē′), *n.* جۆرە ماسییەکە.
**tumble** (tum′b'l), *v.i.* (١) تەقلەلێدان؛ تەقلەبازی کردن.
(٢) (ا) هەرەس بردن؛ لەپڕ ڕووخان؛ لەپڕ کەوتن.
(ب) لەپڕ شکان (نرخ) *( Prices ~d.)* .
(٣) پێ هەڵکەوتن؛ چورتم دان؛ سانتمەدان؛ نووچ دان؛ سەرسم دان.
(٤) خل بوونەوە؛ ئەم دیوو ئەودیو کردن؛ تەپاوتل کردن.
(٥) بەپەلەو لەتردانەوە ڕۆیشتن: *( She ~d out of bed half awake.)*
(٦) ( ~ **to** ) [Slang]، لەپڕ بۆ دەرکەوتن؛ لەپڕ پێ زانین.
*v.t.* (١) ڕووخاندن؛ خستن؛ ڕماندن؛ تەپاوتل پێدان؛ دان بە زەویدا؛ خل کردنەوە؛ ئەم دیوو ئەودیو پێکردن؛ تەقلە پێدان؛ هەرەس پێ بردن
(٢) بەسەر یەکدا دان؛ تێکەڵ وپێکەڵ کردن؛ تێکدان؛ شێواندن
(٣) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە.
*n.* (١) (ا) تەقلە؛ تەقلەلێدان (ب) کەوتن؛ ڕووخان؛ هەرەس.
(ج) چورتم؛ سانتمە؛ پێ هەڵکەوتن
(٢) شێوان؛ شێواوی؛ تێکەڵ وپێکەڵی؛ ناڕێك وپێکی.
(٣) کۆمەڵێکی تێکەڵ وپێکەڵ یا ناڕێك وپێك.
**tumblebug** (tum′b'l-bug′), *n.* گووخلێنکە: قالۆنچەیەکی ڕەشە تەرسی وولاخ کۆدەکاتەوەو خڕ هەڵی دەداتو خلی دەکاتەوە
**tumble-down** (tum′b'l-doun′), *adj.* پەرپووت؛ شەق وشڕ؛ خەریکە بڕووخێ: *( He lived in a ~ shack.)* .
**tumbledung** (tum′b'l-duŋ′), *n.* = **tumblebug.**
**tumbler** (tum′blēr), *n.* (١) تەنافباز؛ تەقلەباز.
(٢) سەگی کەروێشکگر.
(٣) کۆتری تەقلەباز. (هەروەها " **tumble pigeon** " ) .
(٤) پەرداخ. (٥) پڕ پەرداخێك؛ ئەو خواردنەوەیەی لە پەرداخێکدایە
(٦) ئەو پارچەیەی قفڵە کە دەبێ بجووڵێنرێ تاکو قفڵەکە بکرێتەوە
(٧) بووکەشووشەیەکە کە دەستی تێوەدرا بەم لاو بەولادا دەکەوێتو دوایی دێتەوە جێی خۆی.
(٨) (ا) مەکینەی جل ووشك کردنەوە. (ب) **tumbling box**
(٩) ئەو پارچەیەی گێڕی مەکینەی ئوتومبیلی پێ دەگۆڕرێت
**tumbleweed** (tum′b'l-wēd′), *n.* گیاخلێنکە؛ بنچکی ووشکی هەڵکەنراوی باهەڵگرتوو.
**tumbling** (tum′b'l-iŋ), *n.* تەنافبازی؛ تەقلەبازی
**tumbling box** ( or **barrel** ), بەرمیلی خولاوە: بۆ شت تێکەڵ کردن، ساف ولووس کردن، یا پاك کردنەوە.
**tumbrel, tumbril** (tum′brəl), *n.* (١) ئامێری سزادانی کۆن.
(٢) گالیسکەی هەڵگەڕاوەی جووتیار. (٣) گالیسکەی گواستنەوەی تاوانباران بۆ سەر پەڕاندنیان بە " گیۆتین " لەکاتی شۆڕشی فەرەنسیدا
(٤) گالیسکەیەکی دووپێنچکەیی سوپاییە بۆ جبەخانە گواستنەوە
**tumefacient** (tū′mə-fā′shənt), *adj.* دەبێتە هۆی ئاوسان.
**tumefaction** (to͞o′mə-fak′shən, tū′mə-fak′shən), *n.* (١) (ا) ئاوسان (ب) ئاوساوی. (٢) ئەندامی ئاوساو یا هەوکردوو
**-tumefactive** *(adj.).*
**tumefy** (to͞o′mə-fī′, tū′mə-fī′), *v.t.* ئاوساندن.
*v.i.* ئاوسان.
**tumescence** (to͞o-mes′'ns, tū-mes′'ns), *n.* (١) ئاوسان؛ ئاوساوی (٢) ئەندامی ئاوساو.
**tumescent** (to͞o-mes′'nt, tū-mes′'nt), *adj.* ئاوساو؛ هەوکردوو
**tumid** (to͞o′mid, tū′mid), *adj.* (١) ئاوساو؛ هەوکردوو
(٢) فشە؛ لە ئەندازە بەدەر ڕازاوە؛ ناسادە: *( a ~ prose style)*
(٣) دەرپۆقیو؛ پڕ.

-**tumidity** *(n.)*; **tumidly** *(adv.)*.

**tummy** (tum′i), *n.* [Colloq.]. = **stomach.**

**tumor, tumour** (too′mĕr, tū′mĕr), *n.* (١) بريني شێرپەنجە؛ سندان (شێرپەنجە)؛ دوومەڵ؛ بريني پيسي دەرپۆقيو. (٢) ئاوساوی؛ لوو؛ شوێنێكی ئاوساو

**tumorous** (tōō′mĕr-əs, tū′mĕr-əs), *adj.* (١) سنداني؛ تايبەتی بە بريني شێرپەنجە. (٢) بريني شێرپەنجەيي؛ بريناوی؛ سنداناوی

**tumour** (tōō′mĕr, tu′mĕr), *n.* = **tumor.**

**tumular** (tōō′myoo-lĕr, tū′myoo-lĕr), *adj.* گردۆلكەيی

**tumulose** (tōō′myoo-lōs′, tū′myoo-lōs′), *adj.* *Also* **tumulous,** پڕە لە گردۆلكە؛ گردۆلكەی زۆرە

**tumult** (tōō′mult, tū′mult), *n.* (١) دەنگەدەنگ (جەماوەر)؛ هەرا؛ هەراوهوريا؛ ژاوەژاو (٢) پشێوی؛ ئاشووب. (٣) مێشكو هەست وورووژان؛ شێوان: *( His mind was in a ~ .)* .

**tumultuary** (tōō-mul′chōō-er′i, tū-mul′choo-er′i), *adj.* (١) شێواو؛ تێكەڵوپێكەڵ؛ ناڕێكوپێك (٢) **tumultuous**

**tumultuous** (tōō-mul′chōō-əs, tū-mul′choo-əs), *adj.* (١) گەرم (مەجار)؛ دەنگەدەنگاوی؛ ژاوەژاوی *( a ~ welcome, convention, debate, etc.)*
(٢) ئاشووبگێڕ؛ ئاژاوەچی: *( a ~ group of students)* .
(٣) وورووژاو؛ بێ ئارام *( a ~ heart, mind, etc.)* .

-**tumultuously** *(adv.)*.

**tumulus** (tōō′myoo-ləs, tu′myoo-ləs), *n.* گردۆلكەی سەر گۆڕ؛ كۆمەڵە خۆڵی سەر گۆڕ.

**tun** (tun), *n.* (١) بەرميلی مەیو بيرە.
(٢) پێوانەيەكی شلەيە بريتیيە لە ٢٥٢ گالۆن.
*v.t.* كردنە ئەم جۆرە بەرميلەوە؛ لە بەرميلدا هەڵگرتن

**tuna** (tōō′nə), *n.* توونە (جۆرە ماسیيەكە)

**tuna** (tōō′nə), *n.* = **prickly pear.**

**tunable** (tōō′nə-b'l, tū′nə-b'l), *adj.* *Also* **tuneable.** (١) ساز دەكرێت (ئامێری مۆسيقا)؛ خۆش ئەوا دەكرێت (٢) **tuneful**

**tundra** (tun′drə, toon′drə), *n.* تەندرا (دەشتی ڕووتی بێ دارو درەختی هەرێمی تەوەری باكووری.

**tune** (tōōn, tūn), *n.* (١) دەنگ (٢) ئاواز؛ ئەوا.
(٣) يەك ئەوايی؛ يەك دەنگی؛ يەك ئاوازی.
*v.t.* (١) سازكردنی ئامێری مۆسيقا؛ خۆش ئەوا كردن. *( to ~ a musical instrument)*
(٢) گونجاندن؛ شياندن؛ سازكردن؛ يەك ئەوا كردن
(٣) سۆزكردن؛ بە ئاواز دەربڕين
*v.i.* يەك ئەوا بوون؛ گونجان؛ سازان

**change one's tune,** هەڵوێستی خۆ گۆڕين؛ هەڵوێستو ڕەفتاری خۆ چاك كردن

**sing a different tune,** = **change one's tune.**

**to the tune of,** [Colloq.]. ئەوەندە (پارە، نرخ، خەرجی... هتد).

**tune in,** گوێگرتن (ڕاديۆ)؛ خستنە سەر ئێستگەيەكی تايبەتیو گوێگرتن.

**tune off,** گوێ نەگرتن (لە كەسێك)؛ گوێ داخستن.

**tune out,** چاك كردنی ڕاديۆو وازەواز نەهێشتن لەسەری.

**tune up,** (١) سازدانی ئامێری مۆسيقا
(٢) سازدان يا سەركردنی بەشی كارەبايی ئوتومبيل: *( to tune up a car)* .

**tuneful** (tōōn′fəl, tun′fəl), *adj.* خۆش ئاواز؛ يەك ئەوا؛ ساز؛ خۆش؛ مۆسيقی

-**tunefully** *(adv.)*; **tunefulness** *(n.)*.

**tuneless** (tōōn′lis, tūn′lis), *adj.* بێ ئاواز؛ (ساز) ناخۆش؛ نامۆسيقی

-**tunelessly** *(adv.)*; **tunelessness** *(n.)*.

**tuner** (tōōn′ĕr, tūn′ĕr), *n.* (١) سازكەری ئامێری مۆسيقا؛ ئاواز خۆشكەر: *( a piano ~ )* .
(٢) ئامێری سازاندنی دەنگی ڕاديۆ.

**tune-up** (tōōn′up′), *n.* سازدانی بەشی كارەبايی مەكينەی ئوتومبيل؛ سازكردنی ئوتومبيل: *( My car needs a ~ .)* .

**tung oil,** ڕۆنی تانگ: لە بەری داری " تانگ " دەردەهێنرێتو لە بۆيەدا بەكاردێت.

**tungsten** (tuŋ′stən), *n.* تەنگستن: توخمێكی كانزايی خۆڵەمێشیيە لە سەخت كردنی پۆڵاو دروستكردنی تەلی ناو گڵۆپی كارەبادا بەكاردێت.

-**tungstenic** *(adj.)*.

**tungsten lamp,** گڵۆپی تەنگستن: تەلی ناوەكەی لە تەنگستن دروستكراوە.

**tungsten steel,** پۆڵای تەنگستن: پۆڵايەكی زۆر سەختە تەنگستنی تێدايە.

**tungstite** (tuŋ′stit), *n.* تەنگستيت: كانزايەكی زەرد يا زەردی سەوزباوە.

**tung tree,** داری تانگ: درەختێكی بەنرخە ڕۆنێكی ووشككەرەوە لە بەرەكەی دەردەهێنرێتو لە بۆيەدا بەكاردێت. (هەروەها " **tung-oil tree** ") .

**tunic** (tōō′nik, tū′nik), *n.* (١) بەرگێكی كۆنی يۆنانیو ڕۆمانی وەك كراسە هەتا ئەژنۆ. (٢) چاكەتێك يا بلووسێكی دەڵبە پشتێنی لەسەر دەبەسترێ (٣) چاكەتی پۆليسو سەرباز. (٤) **tunicle** .
(٥) پەردەی دەرەوە يا بەری ئەندامی گياندار.
(٦) پێستی تۆو يا ڕووەك.

**tunica** (tōō′ni-kə, tū′ni-kə), *n.* پەردەی داپۆشەر (گيانەوەرناسی، ڕووەكناسی)؛ پێست.

**tunicate** (tōō′ni-kāt′, tū′ni-kāt′), *adj.* (١) ئەلقەئەلقەيی (پيان).
(٢) پەردەدار (گيانەوەرناسی).
*n.* گياندارێكی سەرەتايی دەريايە.

**tunicle** (tōō′ni-k'l, tū′ni-k'l), *n.* جۆرە جبە يا عەبايەكی قەشەيە.

**tuning fork,** چنگاڵی دووپەل دەنگدەرەوە: ئامێرێكی دووپەل دەنگدەرەوەيە لەسەر دەنگەكەی ئامێری مۆسيقا سازدەكرێ.

**tunnage** (tun′ij), *n.* = **tonnage.**

**tunnel** (tun′'l), *n.* (١) (ا) گوڵبێنە. (ب) دووكەڵ كێش. (٢) تونێل
(٣) كون (بەتايبەتی كە گياندارێك هەڵی كەندبێ).
*v.t.* (١) تونێل لێدان؛ تونێل بەژێردا بردن. (٢) كون هەڵكەندن؛ بنكەن كردن.
(٣) تونێل لێدان بۆ چوونە ژوورەوە يا دەرەوە.
*v.i.* تونێل لێدان.

-**tunneler**; **tunneller** *(n.)*.

**tunny** (tun′i), *n.* تەنی: جۆرە ماسیيەكە.

**tup** (tup), *n.* (١) بەران. (٢) سەری مەكينەی پايەو كۆڵەكە داكوتان؛ سەری چەكوش.
*v.t.* پەڕين (بەران)؛ سواربوون؛ جووت بوون.

**tupelo** (tōō′pi-lō′), *n.* (١) درەختێكی زەلكاوی سەختی جەويدارە گوڵی سەوزكارو بەری شينو ئەرخەوانی دەگرێ.
(٢) دارو تەختەی سەختی ئەم درەختە.

**tuppence** (tup′'ns), *n.* = **twopence.**

**tuque** (took, tūk), *n.* تەپلەيەكی چنراوی زستانەيە

**Turanian** (too-rā′ni-ən, tyoo-rā′ni-ən), *n.* (١) تۆرانی.
(٢) زمانە تۆرانیيەكان.
*adj.* تۆرانی؛ تايبەت بە گەلە تۆرانیيەكانو زمانەكەيان.

**turban** (tūr′bən), *n.* (١) سەرپێچ؛ كلاوو جامانە؛ مێزەر.
(٢) شەپقەيەكی ژنانەی بێ لێوارە.

**turbaned, turbanned** (tūr′bənd), *adj.* سەرپێچی بەستووە؛ سەرپێچ لەسەر؛ كلاوو جامانە بەسەر؛ مێزەر بەسەر.

**turbellarian** (tũr'bə-lâr'i-ən), *n.* کرمێکی پانی ئاوی‌یە

*adj.* تایبەتی بەم کرمە

**turbid** (tũr'bid), *adj.* (١) لیل؛ لیخن: ***( a ~ river)*** .

(٢) چڕ (دووکەڵ، هەور)؛ پڕ؛ تاڵ: ***( ~ clouds)*** .

(٣) شێواو؛ پشێو: ***( ~ thoughts)***

**-turbidity; turbidness** ***(n.)***; **turbidly** ***(adv.)***.

**turbidimeter** (tũr'bi-dim'ə-tẽr), *n.* پێوەری لیلی ئاوو شلە.

**turbinate** (tũr'bi-nit, tũr'bi-nāt'), *adj. Also* **turbinated,**

(١) وەك قووچەکی سەربەرەوخوار یا هەڵگەڕاوە

(٢) پێچ پێچۆکەیی (تونکاری)؛ پێچ لوول (ئێسقانی ناو کونەلووت).

*n.* (١) قاوغی پێچ پێچۆکەیی. (٢) ئێسقانی پێچ لوول.

**-turbination** ***(n.)***.

**turbine** (tũr'bin, tũr'bīn), *n.* تۆربین: مەکینەیەکی پێچکەدارە بە هێزی هەڵم، ئاو، یا هەوا دەخولێتەوە: ***( a steam ~ ; a ~ boat)*** .

**turbit** (tũr'bit), *n.* کۆترێکی دەنووك‌و سەر کورتە

**turbo-** (tũr'bō), پێشگرێکە بەمانای: تۆربینی

**turbojet engine,** مەکینەی تۆربینی فڕۆکە

**turbot** (tur'bət), *n.* ماسی‌یە پانکە

**turbulence** (tũr'byoo-ləns), *n. Also* **turbulency.** (١) پشێوی؛ شێواوی؛ بێ ئاسوودەیی؛ ئاشووب. (٢) سەرکێشی؛ یاخیێتی.

(٣) وورووژان (هەوا)؛ توندی هەوا (کە دەبێتە هۆی ئاسە):

***( The plane ran into ~ .)***

**turbulent** (tũr'byoo-lənt), *adj.* (١) سەرکێش؛ یاخی؛ لاسار؛ سەرچڵ ***( a ~ mob)***

(٢) وورووژاو؛ پەشێو؛ هەڵچوو؛ هەڵساو؛ زریاناوی:

***( ~ waters; a ~ river; ~ feelings)***

(٣) شێواو؛ نائاسوودە: ***( a ~ period of history)*** .

**-turbulently** ***(adv.)***.

**Turco-** (tũr'kō, tũr'kə), *Also* **Turko- ,** پێشگرێکە بەمانای: توركی

**Turcoman** (tũr'kə-mən), *n.* = **Turkoman.**

**turd** (tũrd), *n.* (١) سس؛ سنەگوو.

(٢) [Vulgar Slang]، کەسێکی هیچ‌وپووچ‌و بێ نرخ.

**tureen** (too-rēn'), *n.* دەفرێکی گەورەو قوولی شۆربایە.

**turf** (tũrf), *n.* (١) هەرێز؛ چیمەن؛ چینی سەرەوەی خاك بە گیاو چیمەنەوە.

(٢) پرچە هەرێز؛ پارچە چیمەن. (٣) پاشماوەی گژوگیای ڕزیو.

(٤) [Slang]: (ا) ناوچەیەکە کە بەدەست تاقمێك شەقارەی هەرزەکارەوە بێت.

(ب) ناوچەی دەسەڵات تیا چەسپاندن؛ مەودای شارەزایی‌و دەسەڵات؛ ناوچە بەتایبەتی کە ئاکۆکی لەسەر بێت).

(٥) ( the ~ ): (ا) گۆڕەپانی غارغارێن (کە چیمەن بێت یا ڕووت).

(ب) غارغارێن؛ پێشبڕکێی ئەسپ.

*v.t.* کردن بە چیمەن؛ چیمەن یا گیا تێدا ڕوواندن.

**-turfy** ***(adj.)***.

**turfman** (tũrf'mən), *n.* حەزلێکەری غارغارێن یا پێشبڕکێی ئەسپ بەتایبەتی خاوەنی ئەسپی پێشبڕکێ).

**turgescence** (tũr-jes''ns), *n.* (١) ئاوساوی؛ تلۆق؛ شوێنی باکردوو

(٢) ئاوسان؛ هەوکردن.

**turgescent** (tũr-jes''nt), *adj.* ئاوساو؛ هەوکردوو؛ باکردوو

**turgid** (tũr'jid), *adj.* (١) ئاوساو؛ باکردوو؛ هەوکردوو؛ فوو تێکراو

(٢) لە ئەندازە بەدەر ڕازاوە (شێوازی نووسین‌و زمان)؛ ناسادە؛ قورس‌و قەبە:

***( a ~ writing style)***

**-turgidity** ***(n.)***; **turgidly** ***(adv.)***; **turgidness** ***(n.)***.

**turgor** (tũr'gẽr), *n.* (١) ئاوسان؛ ئاوساوی؛ باکردن؛ هەوکردن

(٢) مەودای ئاوسانی شانەی زیندووی زیندەوەر.

**Turk** (tũrk), *n.* (١) تورك؛ توركی

(٢) [Now Rare]، کەسێکی دڕندەو دڵڕەق. (٣) ئەسپی توركی.

**turkey** (tũr'ki), *n.* (١) قەلەموون؛ قەل؛ عەلەشیش؛ بۆقلەموون.

(٢) گۆشتی قەل.

(٣) [Slang]، شانۆنامەیەك یا ئاهەنگێکی مۆسیقای سەرنەکەوتوو

(٤) [Slang]، کەسێکی بێ مێشك؛ کەسێکی حۆل‌و گێل.

**talk turkey.** بە ئاشکرا باسکردن؛ قسە لەڕوو بوون؛ ڕاستەوڕوو لێ دووان

**turkey buzzard,** سیسارك.

**turkey cock,** (١) نێرە قەلەموون؛ نێرە قەل.

(٢) کەسێکی لەخۆبایی؛ کەسێکی خۆهەڵکێش یا خۆفشکەرەوە

**turkey red,** (١) ڕەنگی سووری کراوە (٢) قوماشی سوور.

**turkey shoot,** بۆربۆڕێنێکی نیشانچێتی‌یە قەلەموون یا شتی تری جوولاوی تێدا بە نیشان دەنرێتەوە.

**turkey trot.** جۆرە سەمایەکی دووکەس دووکەسی‌یە.

**Turkic** (tũr'kik), *n.* توركی: کۆمەڵە زمانی توركی‌و ئازربیجانی‌و توركمانی‌و کیرگیزی‌و تەتەرو ئۆزبەکی.

*adj.* (١) توركی: تایبەتی بە زمانە توركی‌یەکان.

(٢) توركی: تایبەتی بەو گەلانەی ئەم زمانانە بەکاردەهێنن.

(٣) توركی: تایبەتی بە تورکەکان

**Turkish** (tũr'kish), *adj.* توركی: زمان‌و گەل‌و کلتووری تورکەکان.

*n.* توركی: زمانی توركی

**Turkish bath,** گەرماوی توركی: وەك گەرماوی کوردی‌یە.

**Turkish delight,** لقوم؛ حەڵوا.

**Turkish towel,** خاولی توركی: خاولی‌یەکی لۆکەی ئەستوورو زبرە.

**Turkism** (tũr'kiz'm), *n.* تورکێتی؛ نەریت‌و کلتوورو بیروڕای توركی.

**Turko-** (tũr'kō, tũr'kə), *Also* **Turco- ,** پێشگرێکە بەمانای: توركی.

**Turkoman** (tũr'kə-mən), *n. Also* **Turcoman,** (١) تورکمان؛ تورکمانی: کۆچەرێکی توركی لە ئۆزبەکستان‌و کازاخستان ژیاو

(٢) زمانی ئەم تورکمانانە

**Turk's-head** (tũrks'hed'), *n.* جۆرە گرێ‌یەکی وەك مێزەرە (کەشتیوانی).

**turmeric** (tũr'mẽr-ik), *n.* زەردەچەوە

**turmoil** (tũr'moil), *n.* پشێوی؛ هەراوهوریا؛ وورووژان؛ نائاسوودەیی؛ ئاژاوە؛ ئاشووب.

**turn** (tũrn), *v.t.* (١) (ا) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە: ***( to ~ a wheel)*** .

(ب) بادان؛ وەرچەرخاندن؛ وەرگێڕان: ***( to ~ a key)*** .

(ج) هەڵگەڕانەوە: ***( He ~ed a somersault)*** .

(٢) (ا) خەڕاتی کردن (ب) خڕ هەڵدان.

(ج) بە ڕێك‌وپێکی‌و جوانی داڕشتن: ***( He can ~ fine phrases.)***

(٣) وەرچەرخاندن؛ وەرگەڕاندن: ***( T~ your chair around.)***

(٤) ( ~ over )، ئەم دیوو ئەودیو پێکردن؛ بیرلێکردنەوە:

***( She ~ed the plan over in her mind.)***

(٥) چەماندنەوەی دەمی چەقۆ؛ کول کردن.

(٦) (ا) هەڵدانەوە؛ هەڵگەڕاندنەوە: ***( He ~ed the page.)***

(ب) هەڵگێڕانەوە؛ کێلان

(ج) ئاوەژووکردن؛ هەڵگێڕانەوە (جل)؛ بەرووپشت کردن.

(٧) سەرەوژێرکردن؛ هەڵگێڕانەوە؛ دەمەوخون کردن.

(٨) تێکدان (دڵ)؛ شێواندن؛ دڵ تێکەڵهێنان:

***( The violence ~ed her stomach.)***

(٩) وەرگێڕان؛ لادان؛ شکاندنەوە؛ لێ دوورخستنەوە؛ وەرچەرخاندن:

***( He ~ed the blow.)***

(١٠) (ا) گۆڕین؛ ڕا پێ گۆڕین؛ وەرگێڕان:

***( I ~ed her to progressive views.)***

(ب) لێ هەڵگەڕاندنەوە؛ لێ وەرگێڕان؛ لێ کردن بە دوژمن؛ لێ هاندان:

***( She ~ed his friends against him.)***

turn

(۱۱) پێچکردنەوە (۱۲) تێپەڕین (تەمەن، ژمارە... هتد)؛ تێپەڕبوون.

(۱۳) (ا) گێڕانەوە: پاڵ پێوەنان بۆ دواوە؛ گەڕاندنە دواوە:

*( We ~ed the attack.)*

(ب) بۆ خۆ گەڕانەوە؛ هەڵگەڕانەوە.

*( His own criticism was ~ed against him.)*

(۱٤) بەرەڵاکردن: *( They ~ed him loose.)* .

(۱٥) دەستاودەست پێکردن (پارە، فرۆتەنی)

(۱٦) ئاوڕدانەوە؛ لاکردنەوە؛ ڕووتێکردن؛ ڕوو وەرگەڕاندن.

(۱۷) ڕووتێکردن؛ نیشان لێگرتنەوە؛ ئاراستەکردن:

*( He ~ed his gun on her.)*

(۱۸) مێشك خستنە سەر؛ وەرگێڕان بەرەو:

*( T~ your thoughts to practical matters.)*

(۱۹) بەکارهێنان: *( He ~ed his knowledge to serving people.)* .

(۲۰) گۆڕین بۆ؛ کردن بە: *( It ~s cream into butter.)* .

(۲۱) ئالوگۆڕکردن؛ گۆڕینەوە: *( She ~ed her eggs into hard cash.)* .

(۲۲) وەرگێڕان (لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر)؛ دارشتنەوە بە ووشەی خۆ.

(۲۳) دڵفراندن؛ سەرلێ سەندن؛ شێتوشەیداکردن

(۲٤) ترشان؛ برزکان

(۲٥) کارتێکردن: *( It ~s her nauseous.)*

(۲٦) ڕەنگ گۆڕین؛ ڕەنگ تێکدان.

***v.i.*** (۱) خولانەوە؛ سووڕانەوە.

(۲) سووڕخواردن؛ باخواردن؛ وەرچەرخان: *( The key won't ~ .)* .

(۳) گێژخواردن؛ گێژبوون؛ خولانەوە: *( My head is ~ing.)* .

(٤) خۆ وەرگەڕان؛ لەش وەرگێڕان.

(٥) چەمینەوە؛ چەمانەوە.

(٦) سەرەوژێربوون؛ دەمەونخون بوون؛ هەڵگەڕانەوە.

(۷) دڵ تێکەڵهاتن *( Her stomach was ~ing.)* .

(۸) لادان؛ لە ڕێ لادان.

(۹) بادانەوە؛ وەرگەڕانەوە؛ وەرچەرخانەوە: *( The tide has ~ed.)* .

(۱۰) پێچکردنەوە؛ بادانەوە؛ گۆڕین (ڕێبان).

(۱۱) ئاوڕدانەوە؛ لاکردنەوە.

(۱۲) ڕووتێکردن *( She ~ed to music, literature, God, etc.)* .

(۱۳) لێ هەڵگەڕانەوە؛ ڕا گۆڕین؛ دژ وەستان:

*( He ~ed against his former friends.)*

(۱٤) [Obs.]، ڕارایی کردن؛ دوودڵی کردن.

(۱٥) بوون بە؛ گۆڕان؛ ترشان *( The milk ~ed sour.)* .

(۱٦) بوون بە؛ والێهاتن *( The rain ~ed to sleet.)* .

(۱۷) بۆگەن کردن؛ پیس بوون؛ ترشان.

(۱۸) ڕەنگ گۆڕین؛ ڕەنگی تازە لێ نیشتن: *( The leaves are ~ing.)* .

***n.*** (۱) خولانەوە؛ سووڕانەوە؛ وەرچەرخان. (۲) باخواردن؛ بادان

(۳) (ا) پێچ؛ سووڕ؛ خول: *( Give it one ~ .)*

(ب) ڕووی ئەم پێچە. (٤) ڕوو وەرگێڕان؛ لاکردنەوە

(٥) پێچ؛ پێچکردنەوە؛ وەرگەڕانەوە. *( a ~ to the right)*

(٦) پێچ؛ لوفە (۷) خول؛ سووڕ (ڕاکردن یا بە پێ ڕۆیشتن)؛ چەرخە.

(۸) چەرخی خەرات؛ خەرەك؛ چەرخ

(۹) پێچ؛ جێی پێچکردنەوە یا وەرگەڕانەوە.

(۱۰) گۆڕان؛ گۆڕین (بەرەو باشی یا خراپی): *( a ~ for the better)* .

(۱۱) (ا) سەرەتای چەرخێکی تازەی مێژوو؛ کاتی وەرچەرخان:

*( at the ~ of the century)*

(ب) سەرەتای گۆڕین

(۱۲) چاکە؛ چاکانە؛ پیاوەتی *( He did me a good ~ .)* .

(۱۳) هەوڵ؛ ماوەی هەوڵدان یا تاقیکردنەوە *( a ~ at gardening)* .

(۱٤) نەخۆش کەوتن؛ فێ لێهاتن؛ گێژبوون؛ تووڕەبوون.

(۱٥) نۆرە؛ نۆبە؛ سەرە *( It's his ~ to mow the lawn.)* .

(۱٦) [British]، نۆرە ئیش؛ شەفت

(۱۷) (ا) خۆنواندنێکی کورت لە بەرنامەیەکی جۆراوجۆردا.

(ب) نوێنەری ئەم بەشە کورتە. (۱۸) کڕین و فرۆشتن (پارەبازی)

(۱۹) [Colloq.]، خورپە؛ ڕاچڵەکین.

(۲۰) شێواز یا خوویەکی تایبەتی (بەرگ، گفتوگۆ... هتد).

(۲۱) توانای زکماکی؛ حەز؛ مەیل.

(۲۲) بەرەو؛ ڕووەو: *( The discussion took an interesting ~ .)*

**at every turn,** هەمیشە؛ هەموو کات.

**by turns,** بە نۆرە؛ بە سەرە؛ یەك لە دوای یەك.

**in turn,** بە نۆرە؛ لە نۆرەی خۆیدا؛ بە ڕیز.

**on the turn, [Colloq.],** لە گۆڕیندایە؛ لەکاتی گۆڕیندا.

**out of turn,** (۱) نۆرەی خۆی نییە؛ بێ نۆرە؛ بەبێ سەرە.

(۲) ناوەخت؛ لەکاتی خۆیدا نییە؛ نابەجێ: *( talking out of turn )*

(۳) [Colloq.]، سەرکێشانە.

**take turns,** نۆرەکردن؛ سەرەگرتن.

**to a turn,** زۆر بە چاکی؛ بەو ڕادەیەی پێویستە.

**turn a blind eye,** چاو لێ نووقاندن.

**turn a deaf ear,** گوێ نەگرتن؛ گوێ لێ کەڕکردن؛ خۆ لێ کەڕکردن.

**turn against,** لێ هەڵگەڕانەوە؛ لێ هاندان؛ دژ وەستان.

**turn a hair,** پەست بوون؛ تێکچوون؛ ترسان.

**turn and turn about,** بە نۆرە؛ بە سەرە؛ یەك لە دوای یەك.

**turn away,** (۱) ڕووکردن بەولاوە؛ ڕوو وەرگێڕان:

*( He turned away in disgust.)*

(۲) لێ وەرگەڕان؛ پشت تێکردن.

(۳) وەرنەگرتن؛ جێ نەکردنەوە؛ دەست بە ڕووەوە نان.

(٤) دەرکردن؛ دوورخستنەوە.

**turn back,** گەڕاندنەوە؛ بەرەنگاری کردن و کشانە دواوە:

*( He turned back the attack.)*

**turn color,** (۱) ڕەنگ گۆڕین.

(۲) (ا) ڕەنگ سوور هەڵگەڕان؛ تەریق بوونەوە.

(ب) ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان؛ ڕەنگ زەردبوون؛ ڕەنگ هەڵبزڕکان.

**turn down,** (۱) پەسەند نەکردن؛ نەویستن:

*( to turn a proposal down)*

(۲) دەست بە ڕووەوە نان؛ قسە شکاندن؛ پێ ڕازی نەبوون.

(۳) کزکردن (رادیۆ، چرا... هتد).

**turn in,** (۱) پێچکردنەوە بۆ ناو. (۲) بۆ ناوەوە چوون (پەنجەی پێ).

(۳) پێدان؛ دانەدەست:

*( The students turned in their assignments to the teacher.)*

(٤) دان بە دەست پۆلیسەوە؛ سووسە گەیاندن بە پۆلیس؛ خەبەرلێدان:

*( They turned the fugitive in.)*

(٥) گەڕاندنەوە؛ بۆ گەڕاندنەوە. (٦) دوو قەدکردن.

(۷) [Colloq.]، چوونە جێ؛ نووستن.

**turn loose,** (۱) (ا) بەرەڵاکردن:

*( to turn loose a captured animal)*

(ب) بەر بۆ بەرەڵاکردن؛ جڵەو بۆ شل کردن.

(۲) تەقاندن؛ تەقەپێکردن. (۳) تەقەلێکردن.

**turn off,** (۱) لە ڕێگەیەکی سەرەکی لادانە سەر ڕێگەیەکی تر کە لێی جیا دەبێتەوە. (۲) لێ جیابوونەوە (ڕێگە).

(۳) ئاوگرتنەوە *( to turn off the water, faucet, etc.)*

(٤) کوژاندنەوە (گڵۆپ، چرا، رادیۆ، مەکینە... هتد):

*( Please turn off the light, radio, etc.)*

(٥) لادان؛ لە ڕێڕەوی خۆ لادان؛ ڕێڕەو پێ گۆڕین.

(٦) [British]، دەرکردن (فەرمانبەر، کرێکار).

**turn on,** (۱) کردنەوە (بەلووعە). (۲) داگیرساندن (چرا، گڵۆپ).

(۳) کردنەوە (رادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ خستنەگەڕ

(٤) تێ بەربوون؛ تێ بەردان؛ لێ هەڵگەڕاندنەوە؛ پەلاماردان.

(٥) کەوتنەسەر ئەوە؛ بەوەوە بەستران؛ لەسەر ئەوە وەستان.
(٦) (ا) گەشکەداربوون (بە بەنگ خواردن)؛ شەیدابوون.
(ب) هێنانە جۆش‌وخرۆش؛ هەوەس هەڵساندن:
*( Rock music turns her on.)*
**turn** **one's back on,** پشت تێکردن
*( He turned his back on his friends.)*
**turn** **one's head,** سەر لێ سەندن؛ لە خۆبایی بوون
**turn** **one's stomach,** دڵ تێکەڵهێنان: قێز لێهاتنەوە؛ زۆر پەست کردن.
**turn** **out,** (١) کوژاندنەوە (گڵۆپ، چرا). (٢) خستنە دەرەوە.
(٣) دەرکردن؛ کردنە دەرەوە
(٤) چوون بۆ (کۆبوونەوە، دەنگدان... هتد)؛ چوونە دەرەوە؛ هاتن:
*( Thousands turned out to welcome the president.)*
(٥) هێنانە بەرهەم.
(٦) لە ئەنجامدا وا بوون؛ والێهاتن: *( The meal turned out fine.)* .
(٧) وا دەرکەوتن؛ وا بوون
*( The suspect turned out to be innocent.)*
(٨) (ا) هەڵگێڕانەوە؛ هێنانە دەرەوە: *( turning out his pockets.)* .
(ب) بەتاڵ کردنەوە بۆ پاك کردنەوە؛ پاك کردنەوە.
(٩) جل لەبەرکردن؛ شت پێدان‌و ڕێك‌وپێك کردن.
(١٠) [Colloq.]؛ لە جێگە هەڵسان؛ لە خەو هەڵسان.
**turn** **over,** (١) تەپا وتل کردن؛ ئەم دیوو ئەودیو کردن.
(٢) سەرەوژێرکردن؛ هەڵگێڕانەوە
(٣) وەرگەڕاندن؛ وەرگێڕان؛ وەرچەرخاندن؛ تەپا وتل پێکردن.
(٤) بەووردی بیرلێکردنەوە.
(٥) دان بەدەستەوە؛ پێدان:
*( He turned the evidence over to the police.)*
(٦) دەسەلات پێدان؛ پێ سپاردن.
(٧) گۆڕین؛ بەکارهێنان بۆ مەبەستێکی تر.
(٨) فرۆشتن؛ فرۆشتن‌و فرۆتەنی تر خستنەوە جێ.
(٩) بایی ئەوەندە کڕین‌و فرۆشتن
**turn** **round,** (١) ڕوو وەرگێڕان؛ لاکردنەوە؛ ئاووڕدانەوە
(٢) بادانەوە: ڕا گۆڕین؛ هەڵوێست گۆڕین.
(٣) بار داگرتن‌و بارکردن‌و گەڕانەوە (کەشتی).
**turn** **tail,** لە ترسدا ڕاکردن.
**turn** **the scale,** خستن بە لایەکدا؛ بڕینەوەی مەسەلەیەك؛
تای تەرازوو خستن بە لایەکدا.
**turn** **the corner,** لە تەنگ‌وچەڵەمە ڕزگاربوون.
**turn** **the tables,** بارودۆخ گۆڕین یا وەرگێڕان (بەتایبەتی لە ململانێ یا
بەربەرەکانێدا): *( Fortune turned the tables and he won.)* .
**turn** **the tide,** بارودۆخ گۆڕین یا وەرگێڕان بەرەو باشی:
*( That event turned the tide for the allies in the war.)*
**turn** **the trick,** ئەنجام دان بەدەستەوە؛ کار بەجێهێنان.
**turn** **to,** (١) پەنا بردنەبەر؛ پەنا بۆ بردن؛ داڵدە بۆ بردن:
*( The child turned to its mother for comfort.)*
(٢) ڕووتێکردن: *( He turned to God.)* .
(٣) ڕاوێژ پێکردن. (٤) دەست بە ئیش کردن؛ خەریکی ئیش بوون.
**turn** **up,** (١) هەڵکردن (دەرەلنگی پانتۆڵ... هتد)؛ نوشتاندنەوە.
(٢) قارسکردن (کراس)؛ پەراوێز کورتکردنەوە.
(٣) سەر هەڵبڕین؛ چاو هەڵبڕین.
(٤) دەرخستن (بە کنەکردن)؛ خستنەڕوو؛ هەڵماڵین:
*( The investigation has turned up new evidence.)*
(٥) دەنگ بەرزکردنەوە (رادیۆ، تەلەفزیۆن)؛ زیادکردن.
(٦) بەرەو ژوور بوونەوە؛ بۆ سەرەوە چوون؛ سەرکەوتن.
(٧) ڕوودان؛ هاتنەدی.
(٨) دەرکەوتن؛ سەرهەڵدان؛ هاتن:
*( He promised to come but he hasn't turned up yet.)*
(٩) دۆزرانەوە؛ سەرهەڵدان
*( The watch will turn up one of these days.)*
**turn upon,** (١) تێ بەربوون؛ پەلاماردان.
(٢) کەوتنەسەر ئەوە؛ لەسەر ئەوە وەستان؛ بەوەوە بەستران.

**turnabout** (tũrn'ə-bout´), *n.* (١) ڕوو وەرگێڕان؛ ئاووڕدانەوە؛
لاکردنەوە. (٢) (ا) هەڵگەڕانەوە؛ دووڕوویی؛ بێ باری؛ گۆڕینی تەواوی.
(ب) پەیمان شکێن؛ ناپاك؛ بێ بار؛ هەڵگەڕاوە (لە حیزب‌و کۆمەڵی خۆ)
(٣) **merry-go-round** .

**turnaboutface** (tũrn'ɔ-bout´fās´), *n.* = **turnabout # 2.**

**turnaround** (tũrn'ə-round´), *n.* (١) جێی پێچکردنەوەی
ئوتومبیل. (٢) **turnabout # 2** .
(٣) کاتی چوون‌و هاتنەوەو بارکردن‌و داگرتنی کەشتی.

**turnbuckle** (tũrn'buk´l), *n.* ئامێری توندکەرەوە.

**turncoat** (tũrn'kōt´), *n.* کەسێکی هەڵگەڕاوە لە ڕێبازو حیزبی خۆی
(بەتایبەتی بۆ سوودی خۆی)؛ ناپاك؛ بێ بار؛ پەیمان شکێن.

**turner** (tũr'nẽr), *n.* خەرات.

**turner** (tũr'nẽr), *n.* (١) ئەندامی یانەی تەنافبازان. (٢) تەنافباز.

**turnery** (tũr'nẽr-i), *n.* خەراتی.

**turning** (tũr'niŋ), *n.* (١) خوولانەوە؛ سووڕانەوە؛ وەرچەرخان؛ بادان؛
هەڵگەڕانەوە. (٢) خەراتی (٣) داڕشتن (چیرۆك‌و بەرهەمی ویژەیی تر).
(٤) پێچ (ڕێگە).

**turning point,** (١) خاڵی گۆڕان؛ جێی وەرچەرخان یا بادان؛
سەرەتای گۆڕان. (٢) کاتێکی زۆر گرنگ؛ کاتی شت یەکلاکردنەوە:
*( This is a ~ in your history.)*

**turnip** (tũr'nip), *n.* شێلم.

**turnix** (tũr'niks), *n.* باڵندەیەکە لە زیقاوڵە دەچێ.

**turnkey** (tũrn'kē´), *n.* زیندانەوان؛ بەندیوان؛ کلیلداری بەندیخانە

**turn-out** (tũrn'out´), *n.* لاڕێ؛ ڕێگەیەکی جیابووەوە لە شاڕێ.

**turn-out** (tũrn'out´), *n.* (١) هاتنە دەرەوە
(٢) کۆبوونەوەی جەماوەری؛ ئامادەبوونی بە کۆمەڵ (هەڵبژاردن، کۆبوونەوە).
(٣) [British]، (ا) مان گرتن. (ب) مانگر. (٤) بەرهەم.
(٥) (ا) پانایی‌یەکە لە قەراغ ڕێگەیەکی تەسکدا ئوتومبیلی تێدا لادەدات تاکو
ئوتومبیلە خێراکان تێپەڕبن. (ب) لاڕێی کورت. (٦) **sidetrack** .
(٧) گالیسکەو ئەسپ‌و قایش‌وقرووش.
(٨) کەرەسەو جل‌وبەرگ.

**turnover** (tũrn'ō´vẽr), *n.* (١) (ا) هەڵگەڕانەوە. (ب) گۆڕان.
(٢) کێکێکی بچووکە ناوەکەی پڕە لە مرەباو لایەکی هەڵگەڕاوەتەوە بەسەر
لاکەی تریدا. (٣) ژمارەی ئەو جارانەی کە فرۆتەنی‌یەك دەفرۆشرێت‌و
شوێنەکەی پڕ دەکرێتەوە لە ماوەیەکی تایبەتیدا.
(٤) سەرجەمی کڕین‌و فرۆشتنی ماوەیەکی تایبەتی.
(٥) سەرجەمی بەشی دەستاودەست کردوو لە ماوەیەکی تایبەتیدا (پارەبازی).
(٦) (ا) ژمارەی کرێکاری بەکرێ گیراو بۆ جێگرتنەوەی ئەوانەی کە وازیان
هێناوە لە ماوەیەکی تایبەتیدا.
(ب) سەرجەمی ئەم کرێکارانە‌و سەرجەمی هەموو کرێکارانی کارگەکە یا
دەزگاکە.
*adj.* هەڵگەڕاوە: *( a ~ collar)* .

**turnpike** (tũrn'pīk´), *n.* (١) **turnstile** . (٢) **tollgate** .
(٣) **toll road** . (٤) شاڕێ.

**turnsole** (tũrn'sōl´), *n.* (١) گوڵەبەڕۆژە؛ هەر ڕووەکێکی تر کە
گوڵەکەی ڕووبکاتە خۆر. (٢) ڕووەکێکە ڕەنگی ئەرخەوانی لێ دەگیرێت
(٣) ئەم ڕەنگە یا خومە ئەرخەوانی‌یە.

**turnspit** (tũrn'spit´), *n.* (١) کەسێکە شیشی گەورەی مەڕو بەراز
برژاندن لەسەر ئاگر دەسووڕێنێتەوە.
(٢) سەگێکە فێرکراوە ئەم شیشە بسووڕێنێتەوە.

**turnstile** (tũm′stīl ′), *n.* دەرگای سووڕاوە: بریتی‌یە لە دوو شیشی
چەپ و ڕاست لێکدراو لە هەر سووڕانەوەیەکدا یەك کەس لێوەی دەچێتە ژوور.
**turnstone** (tũrn′stōn ′), *n.* بەردهەڵدەرەوە: باڵندەیەکی کۆچەری
کەنار دەریایە لە توخمی چۆلەکەی ئاو (خڕکەبەرد هەڵدەداتەوەو بە شوێن
خواردندا دەگەڕێ).
**turntable** (tũm′tā ′b′l), *n.* (١) ڕووبەکی تەختی خولاوەی هێڵدارە
مەکینەی شەمەندەفەری دەخرێتە سەر بۆ سووڕانەوەی.
(٢) مێزی خولانەوەی قەوان.
**turnup** (tũm′up ′), *n.* شتێکی هەڵگەڕ وە (وەك پەراوێزی پانتۆڵ).
*adj.* هەڵگەڕاوە
**turnverein** (toorn′fer-ın ′), *n.* یانەی تەنافبازان
**turpentine** (tũr′pən-tīn ′), *n.* تەرپەنتین: ڕۆنی تەرپەنتین
*v.t.* (١) تەرپەنتین لێدان.
(٢) ڕۆنی تەرپەنتین گرتن لە شیلەی سنەوبەرو سەروو
**turpitude** (tũr′pə-tood ′, tũr′pə-tūd ′), *n.* (١) ڕەووشت نزمی:
ڕەووشت پیسی: سووکی؛ نزمی؛ بێ ڕەووشتی
(٢) کارێکی ڕەووشت نزمانە: کردەوەیەکی ڕەووشت پیس و سووکانە.
**turquoise** (tũr′koiz, tũr′kwoiz), *n.* (١) پیرۆزە: بەردێکی بەنرخی
شینی سەوزکار یا شینی ئاسمانی‌یە. (٢) ڕەنگی شینی سەوزکار؛ پیرۆزی.
*adj.* شینی سەوزکار
**turret** (tũr′it), *n.* (١) قوللە یا بورجی بچووکی سەرسووچی خانوو بۆ
جوانی. (٢) بورجێکی پێچکەدارە بە مەنجەنیق و چەکی ترو سەربازەوە لە کۆندا
بەکاردەهێنرا بۆ هێرش بردنە سەر قەڵا و سەنگەرو شوورەی شاری دوژمن.
(٣) سەنگەری خورلاوەی وەك بورجی کەشتی جەنگ و تانك و فڕۆکەی
بۆمباهاوێژ. (٤) شتێکی خورلاوەی لوولەکی‌یە بۆ کەرەسەی خەڕات.
**turreted** (tũr′it-id), *adj.* (١) بورجدار: بورجی هەیە
(وشەی پێشوو ببینە). (٢) لە بورج دەچێ: بورجی.
(٣) پێچ لوولەکی (وەك قاقلەی گیانداری دەریایی).
**turtle** (tũr′t′l), *n.* (١) کیسەڵی ئاوی: ڕەقەی ئاوی؛ جلە
(٢) [Archaic]، turtledove.
*v.t.* ڕاوکردنی کیسەڵی ئاوی.
**turn turtle,** هەڵگەڕانەوە: وەرگەڕان (بەلەم، کەشتی)
**turtleback** (tũr′t′l-bak ′), *n.* ڕووی قۆمز یا کۆم (بەسەر پێشی
کەشتی‌یەوە درووست دەکرێ لەبەر باوبۆران و هەندێ جاریش بە پشتەکەیەوە).
-**turtleback; turtlebacked** *(adj.).*
**turtledove** (tũr′t′l-duv ′), *n.* کۆترە کێویلە: کۆتری دەشتەکی:
قومری
**turtlehead** (tũr′t′l-hed ′), *n.* ڕووەکێکی ئەمەریکی‌یە گوڵی سپی و
ئەرخەوانی دەگرێ (هەروەها " **snakehead** ").
**turtle-neck** (tũr′t′l-nek ′), *n.* (١) یەخەی هەڵگەڕاوەی پڕ بە پڕی
مل. (٢) سوورێکە کە یەخەکەی هەڵگەڕاوەو پڕ بە پڕی مل بێت.
**turves** (tũrvz), *archaic plural of* **turf.**
**Tuscan** (tus′kən), *adj.* (١) توسکانی: تایبەت بە " توسکانیا " و
خەڵکەکەی. (٢) توسکانی: تایبەت بە شێوازێکی خانووسازی ڕۆمانی کۆن.
*n.* (١) توسکانی: هاونیشتمانی‌یەکی " توسکانیا "
(٢) (ا) یەکێك لە شێوە زمانەکانی " توسکانیا "
(ب) زمانی ویژەیی، واتە پەتی، ئیتالی.
**tush** (tush), *interj.* ووتەیەکە بێزاری و بێ ئارامی دەردەبڕێ
**tush** (tush), *n.* (١) tusk . (٢) کەڵبەی ئەسپ.
**tush** (tush), *n.* [Slang]. قنگ: گووپی سمت؛ گووپی قنگ.
**tusk** (tusk), *n.* (١) شفرە (فیل، بەکانە، فیلی دەریا)؛ ددانی فیل.
(٢) ددانی درێژو دەرپەڕیو: کەڵبە. (٣) شتێکی وەك شفرە
*v.t.* بە شفرە هەڵدڕین، بریندارکردن، یا هەڵکەندن
**tusked** (tuskt), *adj.* شفرەدار
**tusker** (tus′kēr), *n.* گیانداری شفرەدار (فیل، بەکانە)

**tussah** (tus′ə), *n. Also* **tussor,** (١) کرمی ئاوریشمی دەشتەکی.
(٢) ئاوریشمی ئەم کرمە
**tussis** (tus′is), *n.* کۆکە.
-**tussal** *(adj.).*
**tussive** (tus′iv), *adj.* کۆکەیی؛ تایبەت بە کۆکە؛ لە کۆکەوە پەیدابوو.
**tussle** (tus′′l), *v.i.* شەڕکردن؛ شەڕە مستەکۆڵە کردن؛ بەیەکداهاتن.
*n.* (١) شەڕ؛ شەڕە مستەکۆڵە؛ بەیەکدا هەڵپڕژان.
(٢) زۆران (مەجان)؛ ناکۆکی؛ ململانێ.
**tussock** (tus′ək), *n. Also* **tussuck,** (١) تۆپەڵە گیا یا هەرزێ.
(٢) کاکۆڵ؛ گێسوو؛ گودلە.
-**tussocky** *(adj.).*
**tussock moth,** جانەوەرێکی تووکنە کرمۆکەکەی زیان بە داروردەخت
دەگەیەنێ.
**tut** (tut), *interj. Also* **tut tut,** ووتەیەکە بێزاری و بێ ئارامی دەردەبڕێ.
**tutee** (tōō′tē ′, tū′tē ′), *n.* قوتابی‌یەکە مامۆستای تایبەتی خۆی هەبێ؛
قوتابی بە تەنها و تایبەتی فێرکراو.
**tutelage** (tōō′t′l-ij, tū′t′l-ij), *n.* (١) سەرپەرشتی؛ چاودێری: سایە.
(٢) فێرکردن. (٣) لەژێر سایە یا سەرپەرشتیدا بوون؛ چاودێری کران.
**tutelar** (tōō′t′l-ēr, tū′t′l-ēr), *adj. & n.* = **tutelary.**
**tutelary** (tōō′t′l-er ′i, tū′t′l-er ′i), *adj.* (١) پارێزەر؛ چاودێر؛
سەرپەرشتیار: *( a ~ goddess)* .
(٢) تایبەتی بە چاودێری یا سەرپەرشتی.
*n.* فریشتە یا خوای پارێزگار؛ پیری پارێزگار.
**tutor** (tōō′tēr, tū′tēr), *n.* (١) مامۆستای تایبەتی؛ فێرکەری تایبەتی؛
فێرکەر. (٢) پێ سپێردراو یا چاودێری منداڵ و هەرزە بەپێی یاسا.
(٣) ڕابەری قوتابی (لە زانکۆی ئینگلیزیدا).
(٤) یاریدەدەری مامۆستا (لە زانکۆی ئەمەریکیدا).
*v.t.* (١) فێرکردن بەتایبەتی؛ وانە ووتنەوە بەتایبەتی.
(٢) بە توندوتیژی لەگەڵ جووڵانەوە؛ ئامۆژگاری کردن؛ زەبر لەگەڵدا نواندن
(٣) سەرپەرشتی کردن: بوون بە لێپرسراوی منداڵ بەپێی یاسا.
*v.i.* (١) بوون بە مامۆستای تایبەتی؛ لەلەیی کردن.
(٢) [Colloq.]، فێرکران لەلایەن مامۆستای تایبەتی‌یەوە؛ فێرکرانی تایبەتی
**tutorage** (tōō′tēr-ij, tū′tēr-ij), *n.* (١) وانەی تایبەتی ووتنەوە:
پلەی مامۆستای تایبەتی. (٢) کرێی وانە یا فێرکردنی تایبەتی.
**tutorial** (too-tôr′i-əl, tu-tō′ri-əl), *adj.* هی مامۆستای تایبەتی؛
هی وانە یا فێرکردنی تایبەتی.
*n.* وانەی تایبەتی (بۆ یەك قوتابی یا چەند قوتابی‌یەك).
**tutorship** (tōō′tēr-ship ′, tū′tēr-ship ′), *n.* (١) پلەو کارو
دەسەڵاتی مامۆستای تایبەتی؛ مامۆستایەتیی تایبەتی. (٢) tutelage .
**tutti** (too′ti), *adj.* هەموو؛ هەموو سازبەند تێیدا بەشدار دەبێ.
*n.* (١) پارچەیەك مۆسیقایە کە ئەندامانی تیپەکە هەموو تیایدا بەشداربن
(٢) دەنگی ئەم مۆسیقایە؛ ئەنجامی ئەم بەشداری‌یە.
**tutti-frutti** (tōō′ti-frōō′ti), *n.* مرەبا، دۆندرمە، یا نوقوڵی بە
میوەی جۆراوجۆر کراو
*adj.* مرەبا و شتی تری بە میوەی جۆراوجۆر کراو.
**tutty** (tut′i), *n.* توتیا؛ چینکۆ
**tutu** (too′too), *n.* تەنوورەی فشەڵ و کورتی سەماکەری بالیە.
**tu-whit tu-whoo** (tōō-hwit′ tōō-hwōō′), *n.* دەنگی
کوندەپەپوو.
**tux** (tuks), *n.* [Colloq.], **tuxedo.**
**tuxedo** (tuk-sē′dō), *n.* تەکسیدۆ؛ تەکس: (ا) چاکەتی تایبەتی ڕەشی
پیاوان (ب) دەستەجلی ڕەشی ڕەسمی پیاوان
**tuyère** (twē ′yâr′), *n.* کونێکە هەوای لێوە دەکرێتە فڕنەوە
**TV**, **television.**
**twaddle** (twäd′′l), *n.* (١) چەنەبازی؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بێ تام.

(٢) نووسینی هیچ‌وپووچ.
***v.t. & v.i.*** چەنەبازی کردن؛ قسەی هیچ‌وپووچ و بێ تام کردن.
**twain** (twān), ***n. & adj.*** [Archaic or Poetic]. دوو؛ دوان؛ جووت.
**twang** (twaŋ), ***n.*** (١) زرنگە (وەك هی ژێی ئامێرێکی مۆسیقی کە رادەکێشرێت و بەرەڵا دەکرێت)؛ زرنگانەوە؛ قنگە.
(٢) منگنی؛ منگەمنگ؛ بە لووت قسەکردن.
(٣) شێوە زمانی ناوچەیەکە کە منگەمنگی زۆر تێدا بێت.
(٤) [Dial.] twinge.
***v.i.*** (١) زرنگانەوە (ژێی ئامێری مۆسیقی یا کەوان).
(٢) منگەمنگ کردن؛ بە لووت قسەکردن
(٣) قنگەهاتن (تیروکەوان)؛ قنگەکردن.
***v.t.*** (١) زرنگاندنەوە (ژێ). (٢) بە منگەمنگ قسەکردن؛ بە لووت قسەکردن.
(٣) قنگە لێ هەڵسان (تیروکەوان).
**-twangy** ***(adj.).***
**'twas** (twuz, twäz; *unstressed* twəz), = it was.
**tweak** (twēk), ***v.t.*** راکێشان (لووت، گوێ، ریش)؛ نقورچ لێگرتن؛ بادان.
***( to ~ someone's nose)***
***n.*** راکێشان؛ نقورچ؛ بادان.
**tweed** (twēd), ***n.*** (١) قوماشی خوری زبر.
(٢) (*pl.*). جل‌وبەرگی ئەم قوماشە
**tweedle** (twē'd'l), ***v.i.*** (١) ئاوازی ناساز لێدان
(٢) لاواندن بەم جۆرە ئاوازە
***n.*** ئاوازی ناساز.
**tweedledum and tweedledee** (twē'd'l-dum'n-twē'd-'l-dē'), ***n.*** دوو کەس یا شتی دەقاودەق وەك یەك (بەجۆرێك کە لەیەکتری جیانەکرێنەوە).
**'tween** (twēn), ***prep.*** [Poetic]. = between.
**tweet** (twēt), ***n. & interj.*** حریوە؛ جریوەجریو؛ جریکەجریك؛ جووکە
***v.t.*** حریوە هاتن؛ زیقەزیق کردن؛ جریکەجریك کردن.
**tweeze** (twēz), ***v.t.*** بە مووکێش دەرهێنان.
**tweezer** (twēz'ēr), ***n.*** = tweezers.
**tweezers** (twēz'ērz), ***n.pl.*** مووکێش
هەروەها " **a pair of tweezers** ".
**twelfth** (twelfth), ***adj. & n.*** (١) دوانزەهەم؛ دوانزەیەم؛ دوانزەمین.
(٢) دوانزە یەك
**twelve** (twelv), ***adj.*** دوانزە
***n.*** (١) دوانزە؛ ژمارە دوانزە. (٢) دەرزەن؛ دوانزە کەس یا شت.
**twelvefold** (twelv'fōld'), ***adj.*** دوانزە ئەوەندە.
**twelvemonth** (twelv'munth'), ***n.*** ساڵێك
**twentieth** (twen'ti-ith), ***adj. & n.*** (١) بیستەم؛ بیستەمین.
(٢) بیست یەك.
**twenty** (twen'ti), ***adj. & n.*** بیست
**the twenties,** بیستەکان (لە سەدەیەکدا یا لە تەمەنی کەسێکدا)؛ لە بیستەوە هەتا بیست‌ونۆ.
**twentyfold** (twen'ti-fōld'), ***adj. & adv.*** بیست ئەوەندە
**twenty-one** (twen'ti-wun'), ***n.*** بیست‌ویەك (یاری کاغەز)
هەروەها " **black jack** ".
**'twere** (twūr), = it were.
**twibil, twibill** (twī'bil'), ***n.*** (١) تەوری دووددەمە
(٢) پاچ؛ قولنگە. (٣) تەوری دووددەمەی جەنگ
**twice** (twīs), ***adv.*** (١) دوو جار؛ دوو کەرەت. (٢) دوو ئەوەندە
**twice-laid** (twīs'lād'), ***adj.*** (١) لە بەنی گوریسە کۆن دروستکراو.
(٢) لە پاشماوە یا کۆنە شت دروستکراو.
**twice-told** (twīs'tōld'), ***adj.*** (١) دوو جار گێڕراوەتەوە (چیرۆك، دەنگوباس... هتد). (٢) گەلێك جار گێڕراوەتەوە؛ کۆن

**twiddle** (twid''l), ***v.t.*** یاری پێکردن؛ بادان؛ خولاندنەوە.
***v.i.*** (١) یاری پێکردن
(٢) خنەخن کردن؛ خۆ خلافاندن؛ کات بەفیڕۆدان بە شتی هیچ‌وپووچەوە.
(٣) خوولانەوە؛ سووڕانەوە؛ پێچ خواردن.
***n.*** خوولانەوە (وەك کەلەموست بەدەوری یەکدا).
**twiddle one's thumb,** (١) کەلەموست خوولاندنەوە بەدەوری یەکدا.
(٢) کات بەفیڕۆدان؛ کات کوشتن.
**twig** (twig), ***n.*** چڵ؛ خەڵف؛ لقی باریك؛ توول؛ شوول؛ چیلکە؛ چڵ‌وچێو.
**twig** (twig), ***v.t. & v.i.*** [British Slang]. (١) بینین؛ سەیرکردن؛ سەرنج دان. (٢) تێگەیشتن
**twiggy** (twig'i), ***adj.*** (١) ناسك؛ باریك
(٢) گەڵێك لقی لێ بووەتەوە؛ چڵ یا خەڵفی زۆرە.
**twilight** (twī'līt'), ***n.*** (١) کازیوە؛ بەرەبەیان؛ شەبەق؛ ماوەی نێوان رۆژاوا و تاریك داهاتن؛ تاریك و لێڵ؛ تاریك و ڕوون.
(٢) کاتی دوایی پێ هاتن؛ کاتی بەرەو نەمان چوون:
***( He is in the ~ of his life.)***
(٣) دێرین؛ کۆن؛ کاتێکی زۆر کۆن؛ شەبەق (مەجاز):
***( in the ~ of history)***
(٤) سڕی؛ نیوە بەهۆشی و نیوە بێ هۆشی (بە مۆرفین یا دەرمانی سڕکردن):
***( ~ sleep)***
**twill** (twil), ***n.*** (١) قوماشی چنراو بەجۆرێك کە هێڵی لاری تێدابێت.
(٢) نەخشەی ئەم قوماشە.
***v.t.*** چنین بەم شێوەیە.
**'twill** (twil), = it will.
**twilled** (twild), ***adj.*** = twill.
**twin** (twin), ***adj.*** (١) جووت؛ دووان
(٢) دووانە؛ هاوسك؛ هاوزا؛ دووبرالە: ***( ~ sisters; ~ brothers)*** .
***n.*** (١) دووانە؛ هاوسك؛ هاوزا؛ دووبرالە (٢) دووان؛ جووت.
(٣) [T-]. (*pl.*). Gemini . (٤) (*pl.*). جووت بلوور.
***v.t.*** (١) دووانە بوون؛ بە یەك سك دوو منداڵ بوون.
(٢) [Rare]. هاوسك بوون؛ هاوزا بوون (٣) کردن بە جووت؛ دەقاودەق کردن.
***v.i.*** (١) دووانە بوون بە یەك سك. (٢) بوون بە هاوتا یا هاونیلە بۆ.
(٣) جووت گرتن
**twin bed,** چەرپایەی یەك کەسی؛ دانەیەك لە جووتێك چەرپایەی یەك کەسی.
**twinberry** (twin'ber'i), ***n.*** (١) جۆرێکە لە پەنجەی خانم گوڵی ئەرخەوانی دەگرێت (٢) partridgeberry .
**twinborn** (twin'bôrn'), ***adj.*** بە یەك سك لەدایك بوو؛ دووانە؛ هاوزا.
**twine** (twīn), ***n.*** (١) بەن؛ گوش؛ کشتەك؛ تاڵە بەن؛ تاڵە گوش.
(٢) باخواردن؛ لوول بوون؛ پێچ خواردن؛ هۆنرانەوە.
(٣) شتێکی لوول بوو یا هۆنراوە. (٤) ئاڵۆسکان؛ گرێ کوێرە.
(٥) تەرزی لە شتێکەوە ئاڵاو؛ تەرزی لوول یا باخواردوو.
***v.t.*** (١) هۆنینەوە؛ پێکەوە بادان؛ تێکهەڵکێشان؛ لوولدان.
(٢) تێوەئاڵاندن؛ لوولدان بەدەوریدا.
***v.i.*** (١) تێوەئاڵان؛ لوول بوون؛ پێچ خواردن:
***( The ivy ~d round the tree.)***
(٢) پێچاوپێچ کردن؛ بە مارپێچی ڕۆیشتن:
***( a stream ~ing through the forest)***
**-twiner** ***(n.).***
**twinflower** (twin'flou'ēr), ***n.*** رووەکێکە لە توخمی پەنجەی خانم گوڵی پەمەیی و گەڵای بریقاوە دەگرێ
**twinge** (twinj), ***v.t.*** (١) ئازاری تیژو لەپڕ دان.
(٢) [Obs.]. دەرزی پیاکردن؛ نقورچ لێگرتن؛ ئاژنین.
***v.i.*** هەستکردن بە ئازارێکی تیژو لەپڕ؛ ئازاری تیژو لەپڕو ناوبەناو پێداهاتن
***n.*** (١) ئازارێکی تیژو لەپڕ (وەك دەرزی پیاکردن)

(۲) ئازاری ویژدان؛ ئەشکەنجە *( He felt a ~ of conscience)* .
**twinkle** (twiŋ′k'l), *v.i.* (۱) درەوشانەوە؛ بریسکەدانەوە؛
پرشنگدانەوە (ئەستێرە): *( Stars are ~ing in the sky.)* .
(۲) گەشانەوە؛ بریقانەوە: *( His eyes ~d with amusement.)* .
(۳) لەرینەوە؛ شنەکردن: *( The dancer's feet ~d.)* .
(٤) [Archaic]. چاوترووکان.
*v.t.* بریقاندنەوە؛ بریسکە پێدان
*n.* (۱) ترووکەی چاو؛ چاوترووکان.
(۲) گەشانەوە (چاو)؛ بریقانەوە؛ بریسکانەوە.
(۳) درەوشانەوە؛ پرشنگ (ئەستێرە)؛ بریسکە؛ تروسکە.
(٤) ماوەی چاوترووکانێك؛ هەناسەیەك.
**twinkling** (twiŋ′kliŋ), *n.* (۱) درەوشانەوە؛ بریسکانەوە؛ بریقانەوە
(۲) بریسکە؛ بریقە (۳) ماوەی چاوترووکانێك؛ هەناسەیەك
**twirl** (twûrl), *v.t.* (۱) خێرا خولاندنەوە یا سووڕاندنەوە؛ گێژدان.
(۲) هاویشتن (تۆپی بەیسبۆڵ).
*v.i.* خێرا خولانەوە یا سووڕانەوە؛ گێژخواردن
*n.* (۱) خێرا خولانەوە یا سووڕانەوە؛ گێژخواردن.
(۲) (ا) شتی پێچ پێچۆکە؛ شتی بادراو. (ب) پێچ؛ خول؛ سووڕ.
**twist** (twist), *v.t.* (۱) بادان؛ هۆنینەوە؛ لوول دان.
(۲) تێکهەڵکێشان (۳) تێوەئاڵاندن (پەت، گوریس، بەن)؛ پێچانەوە؛ دەوردان.
(٤) وەرگێڕان؛ پێچ پێدان؛ لە جێ بردن *( He ~ed his arm.)* .
(٥) خواروخێچ کردن؛ شێوە تێکدان؛ شێواندن *( He ~ed his face.)* .
(٦) گوشین؛ ووشین؛ ئازاردان
(۷) سەر لێ شێواندن: *( I'm all ~ed.)* .
(۸) ( ~ off ). قرتاندن؛ لێکردنەوە
(۹) شێواندن؛ تێکدان (مانا): *( He ~ed the facts, my ideas, etc.)* .
(۱۰) خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە
*v.i.* (۱) بادران؛ بادان *( The wire ~s easily.)* .
(۲) تێوەئاڵان (۳) خولانەوە؛ سووڕانەوە (٤) پێچکردنەوە؛ لادان.
(٥) پێچاوپێچ کردن؛ خواروخێچ بوون. (٦) بادان؛ لوول دان.
(۷) تلانەوە بە ئازارەوە؛ پێچ‌ولوول خواردن؛ خۆ کرژکردن.
*n.* (۱) تاڵ؛ بەن؛ ڕیس؛ کشتەك. (۲) (ا) گلۆلە توتن. (ب) مارمارە؛ بابۆڵەنان.
(۳) گرێ (٤) (ا) خولانەوە؛ سووڕانەوە (ب) خول؛ سووڕ. (ج) بادان؛ با
(٥) پێچ پێچۆکەیی؛ مارپێچی؛ پێچ؛ چەوتی؛ لوول
(٦) دەموچاو تێکچوون یا شێوان. (۷) وەرگەڕان؛ لە جێ چوون.
(۸) لادان؛ پێچکردنەوە (۹) شێوان (مانا، ڕاستی... هتد)؛ تێکدان.
(۱۰) خوویەکی سەیر؛ ناتەواوی؛ چەوتی (ڕەوشت):
*( a ~ in his character)*
(۱۱) تویست؛ جۆرە سەمایەکە
**twist drill,** سمۆی ئەلەکتریکی پێچ لوولی.
**twister** (twis′tẽr), *n.* (۱) بادەر؛ لوولدەر؛ خولێنەرەوە
(۲) تۆپی هاوێژراوی خولاوە (بێسبۆڵ)
(۳) [Colloq.]. گەردەلوولی قایم؛ گێژەلووکە.
(هەروەها " tornado " و " cyclone " ).
(٤) [British Colloq.]. کەسێکی دەستبڕ؛ ساختەچی.
**twit** (twit), *v.t.* گاڵتەپێکردن (بەتایبەتی لەبەر هەڵەیەك یا کارێکی گەوجانە)؛ سەرزەنشتکردن؛ پێ پێکەنین.
*n.* (۱) پێ پێکەنین؛ گاڵتەپێکردن؛ سەرزەنشت.
(۲) [British Slang]. کەسێکی بێ مێشك یا کەر.
**twitch** (twich), *v.t.* ڕاتەکاندن؛ لەپڕ ڕاکێشان:
*( The fisherman ~ed the line.)*
*v.i.* (۱) فڕین (چاو، ماسوولکەی دەموچاو... هتد)؛ کرژبوون:
*( His face ~ed uncontrollably.)*
(۲) ئازاری لەپڕو تیژو ناوبەناو پێداهاتن.
*n.* (۱) ڕاتەکان؛ لەپڕ ڕاکێشان.
(۲) فڕین (چاو، ماسولکە)؛ کرژبوون: *( a ~ in the eye; a facial ~ )* .
(۳) لەواشە (دەکرێتە لچی ئەسپ بۆ دابینکردنی).
**twitch grass,** = couch grass.
**twitter** (twit′ẽr), *v.i.* (۱) جریوەجریوکردن؛ زیقەزیق کردن؛ خوێندن (باڵندە). (۲) چەنەدان؛ زۆرویژی کردن.
(۳) لەرزین؛ جرت‌وفرت کردن. (٤) **titter** .
*v.t.* بە زیقەزیق یا جرت‌وفرتەوە ووتن.
*n.* (۱) جریوەجریو؛ خوێندن (باڵندە)؛ زیقەزیق؛ جرووکەجرووك؛ جووکەجووك
(۲) **titter** . (۳) جرت‌وفرت؛ فرتەفرت؛ فرت‌وهووڕ.
**twitter** (twit′ẽr), *n.* زیقەزیقکەر؛ جرت‌وفرتکەر؛ چەنەچەنکەر.
**'twixt** (twikst), ***prep.*** [Poetic or Dial.], = **between.**
**two** (to͞o), *adj.* (۱) دوان؛ دوو.
(۲) دووەم: *( section ~ of the instructions)*
*n.* (۱) دوو؛ ژمارە دوو.
(۲) دوو (پووڵی دۆمینە، زار، کاغەزی قومار): *( the ~ of spades)*
(۳) پارەی کاغەزی دوو دۆلاری.
(٤) شتێکی دووبەشی؛ دەستەیەکی دووکەسی.
in two, بە دوو پارچە یا بەشەوە:
*( to cut or divide something in two)*
put two and two together, شت لێکدانەوەو گەیشتنە ئەنجام؛ گەیشتنە ئەنجام بە لێکدانەوەی شتێکی ئاشکرا
**two-bit** (to͞o′bit′), *adj.* [Slang], (۱) بایی چواریەکی دۆلارێکە.
(۲) هەرزانبەها؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ.
**two bits,** [Slang], چواریەکی دۆلارێك؛ بیست‌وپێنج سەنت.
**two-by-four** (to͞o′bə-fôr′, to͞o′bī-fōr′), *adj.* (۱) دوو بە چوار (ئینج یا پێ). (۲) [Colloq.]، تەنگەبەر؛ تەسك؛ بچووك.
*n.* دارێکە ئەستوورایی‌یەکەی دوو ئینج و پانایی‌یەکەی چوار ئینجە (لە خانوو درووستکردندا بەکاردێت).
**two-dimensional** (to͞o′də-men′shən-'l), *adj.* (۱) تەنها پانی و درێژی هەیە؛ دوو دووری. (۲) قووڵ نییە؛ ڕووکەشی؛ هیچ‌وپووچ:
*( ~ fiction, characters, etc.)*
**two-edged** (to͞o′ejd′), *adj.* (۱) دوو دەم (تیغ): *( a ~ sword)* .
(۲) دوو مانا؛ دوو مەبەست.
**two-faced** (to͞o′fāst′), *adj.* (۱) دوو ڕوو؛ دوو ڕووی هەیە.
(۲) دووزبان؛ دووڕوو؛ بێ بار
-two-facedly *(adv.)*; two-facedness *(n.)*.
**two-fisted** (to͞o′fis′tid), *adj.* دڕ؛ بەتین؛ بەهێز؛ نێر.
**twofold** (to͞o′fōld′), *adj.* (۱) دووبەشی؛ دوانە؛ دووپارچەیی.
(۲) دوو ئەوەندە.
*adv.* دوو ئەوەندە؛ دوو قات.
**two-handed** (to͞o′han′did), *adj.* (۱) دوودەستی؛ بە دوو دەست بەکاردەهێنرێ. (۲) دووکەسی؛ بە دوو کەس بەکاردەهێنرێ: *( a ~ saw)* .
(۳) دووکەسی؛ بە دوو کەس دەکرێ: *( a ~ game)* .
(٤) دوودەستە؛ دوو دەستی هەیە.
(٥) هەردوو دەستی وەك یەك بەکاردەهێنێت.
**two-legged** (to͞o′leg′id, to͞o′legd′), *adj.* دوولاق؛ دوولاقی.
**two-master** (to͞o′mas′tẽr, to͞o′mäs′tẽr), *n.* کەشتی دووداری: کەشتی دووستوونی.
**twopence** (tup′'ns), *n.* دوو پەنس.
**twopenny** (tup′ən-i), *adj.* (۱) بە دوو پەنسە؛ دوو پەنسی.
(۲) هەرزانبەها؛ بێ نرخ.
**two-phase** (to͞o′fāz′), *adj.* = **diphase.**
**two-piece** (to͞o′pēs′), *adj.* دووپارچەیی:
*( a ~ bathing suit)*
**two-ply** (to͞o′plī′), *adj.* دوو توێ؛ دوو توێیی؛ دوو چین.

**two-seater** (tōō′sēt′ēr), *n.* ئوتومبیلی دووکەسی؛ ئوتومبیلی دووکورسی.
**two-sided** (tōō′sīd′id), *adj.* (١) دوولا؛ دوولایی (٢) دووڕوو؛ دووڕوویی
**twosome** (tōō′səm), *n.* (١) دوو کەس؛ جووت (٢) یارییەکی دووکەسی (گۆلف). (٣) ئەم دوو یاریکەرە.
**two-spot** (tōō′spot′), *n.* (١) دووخاڵ؛ پووڵی دۆمینە، کاغەزی یاری. (٢) [Colloq.] (ا) کاغەزی دوو دۆلاری (ب) دوو دۆلار
**two-step** (tōō′step′), *n.* (١) جۆرە سەمایەکە (٢) مۆسیقای ئەم سەمایە.
**two-way** (tōō′wā′), *adj.* (١) دووسەری؛ دووسەرە: *( a ~ street)*. (٢) دووسەری؛ ئەلسن؛ وەرگرو نێرەر: *( a ~ radio)* (٣) دووکەسی: *( a ~ race, contest, etc.)*.
**-ty** (ti), پاشگرێکە بەمانای چۆنێتی؛ بار: *( paucity)*.
**-ty** (ti), پاشگرێکە بەمانای ئەوەندە کەرەت دە: *( twenty, forty)*.
**tycoon** (ti-kōōn′), *n.* (١) فەرمانڕەوای سوپای ژاپۆنی کۆن. (٢) [Colloq.] سەرمایەدارێکی زۆر بەدەسەڵات
**tyke** (tīk), *n. Also* tike, (١) سەگی دوورەگ (٢) [Scot.] کەسێکی کەرتری هیچ نەزان (٣) [Colloq.] منداڵی بێ حەیای هاروهاج (لەڕووی خۆشەویستییەوە).
**tymbal** (tim′b'l), *n.* = timbal.
**tympan** (tim′pən), *n.* (١) تەپڵ؛ چەرمی تەپڵ (٢) چەرە ب پەڕوی ژێر گیرەی کاغەزی مەکینەی چاپ (٣) tympanum. (٤) پەردەی هەر ئامێرێك.
**tympani** (tim′pə-ni), *n.pl.* = timpani.
**tympanic** (tim-pan′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە تەپڵ یا چەرمی تەپڵ. (٢) تایبەتی بە تەپڵی گوێ.
**tympanic bone,** ئێسقانی تەپڵی گوێ
**tympanic membrane,** پەردەی گوێ؛ تەپڵی گوێ.
**tympanist** (tim′pə-nist), *n.* تەپڵژەن
**tympanites** (tim′pə-nī′tēz), *n.* باکردن؛ سك ئاوسان.
**tympanitis** (tim′pə-nī′tis), *n.* پەردەی گوێ ئاوسان.
**tympanum** (tim′pə-nəm), *n.* (١) (ا) گوێی ناوەڕاست (ب) پەردەی گوێ؛ تەپڵی گوێ. (٢) (ا) تەپڵ. (ب) چەرمی تەپڵ. (٣) timpani. (٤) پەردەی بیستۆکی تەلەفۆن.
**tympany** (tim′pə-ni), *n.* (١) باکردن؛ سك ئاوسان. (٢) (ا) فیز؛ خۆبادان؛ لەخۆباییبوون. (ب) شێوازی لە ئەندازە بەدەر ڕازاوە.
**typal** (tī′p'l), *adj.* (١) نموونەیی (٢) [Rare]. جایی؛ تایبەت بە چاپکردن.
**type** (tīp), *n.* (١) نموونە؛ وێنە (٢) کلیشە؛ شێوە؛ شێواز. (٣) جۆر؛ چەشن *( a new ~ of airplane; an animal of the dog ~ )* (٤) تۆخم؛ بابەت (٥) نیشانە (٦) تیپ (ئامێری تیپنووس). (٧) تیپی چاپکراو *( Small ~ is hard on the eyes.)*.
*v.t.* (١) نیشانەی ئەوە بوون. (٢) نموونە یا وێنەی شتێك بوون؛ وەك نموونە یا نوێنەر وابوون. (٣) پۆل پۆل کردن؛ هاوپۆل کردن؛ جۆرجۆرکردن (خوێن). (٤) چاپکردن.
*v.i.* ئامێری تیپنووس بەکارهێنان؛ چاپکردن
**-type** (tīp), پاشگرێکە بەمانای: (١) نموونە؛ وێنە؛ چەشن: *( prototype)* (٢) چاپ؛ چاپکردن؛ تیپ: *( monotype)*
**type founder,** تیپ دارێژ.
**type foundry,** دارێژگەی تیپ
**type metal,** کانزای تیپ دروستکردن (کە بریتییە لە ئاوێتەی قوڕقوشم و تەنەکە)
**typescript** (tīp′skript′), *n.* شتی چاپکراو.
**typeset** (tīp′set′), *v.t.* تیپ ڕێکخستن.
**typesetter** (tīp′set′ēr), *n.* (١) تیپ یا چاپ ڕێکخەر (٢) مەکینەی تیپ ڕێکخەر
**typesetting** (tīp′set′iŋ), *n.* تیپ ڕێکخستن؛ چاپ ڕێکخستن.
**type specimen,** نموونەی تۆخم (گیانەوەرزانی).
**typewrite** (tīp′rīt′), *v.t. v.i.* چاپکردن.
**typewriter** (tīp′rīt′ēr), *n.* (١) تیپنووس؛ ئامێری تیپنووس؛ چاپ؛ ئامێری چاپکردن. (٢) [Archaic] typist
**typewriting** (tīp′rīt′iŋ), *n.* (١) چاپکردن. (٢) شتی چاپکراو.
**typewritten** (tīp′rit′'n), *past participle of* typewrite.
*adj.* چاپکراو.
**typhlitis** (tif-lī′tis), *n.* ئاوسانی ڕیخۆڵە کوێرە.
**typhlology** (tif-lol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی کوێری.
**typhlosis** (tif-lō′sis), *n.* کوێری
**typhogenic** (tī′fə-jen′ik), *adj.* دەبێتە هۆی گرانەتا.
**typhoid** (ti′foid), *adj.* گرانەتایی؛ تایبەتی بە گرانەتێ.
*n.* گرانەتا؛ گرانەتێ؛ کەوتوویی
**typhoid bacillus,** میکرۆبی گرانەتا.
**typhoid fever,** typhoid.
**typhoon** (ti-fōōn′), *n.* تایفوون؛ گێژەڵووکەیەکی زۆر قایمی دەریای چین و ئاوچەکانی دەوروپشتییەتی.
**typhous** (tī′fəs), *adj.* ڕەشەگرانەتایی؛ تیفۆسی
**typhus** (tī′fəs), *n.* ڕەشەگرانەتا؛ تیفۆس. (هەروەها " typhus fever ")
**typical** (tip′i-k'l), *adj. Also* typic, (١) نموونەیی؛ وێنەیی. (٢) تایبەتی بە؛ تایبەخۆ؛ نیشانە: *( He has the mannerisms ~ of his class.)*
-typically *(adv.)*.
**typify** (tip′ə-fī′), *v.t.* (١) وەك نموونە وابوون؛ وەك نوێنەر یا وێنە وابوون (٢) نیشانەبوون؛ تایبەخۆی شتێك بوون.
-typification *(n.)*; typifier *(n.)*.
**typist** (tīp′ist), *n.* چاپکەر
**typo** (tī′pō′), *n.* [Colloq.]. هەڵەی چاپ.
**typo-** (tī′pō, tī′pə), پێشگرێکە بەمانای: تیپ: *( typography)*.
**typographer** (tī-pog′rə-fēr), *n.* (١) تیپ ڕێکخەر؛ چاپ ڕێکخەر. (٢) چاپچی؛ چاپکەر
**typographic** (tī′pə-graf′ik), *adj. Also* typographical, هی چاپ و چاپگەری.
-typographically *(adv.)*.
**typography** (tī-pog′rə-fi), *n.* (١) چاپگەری؛ چاپکاری؛ چاپچێتی (٢) تیپ ڕێکخستن (٣) شێوازی چاپەمەنی؛ شێوەی شتی لە چاپ دراو
**typology** (tī-pol′ə-ji), *n.* (١) نموونەناسی؛ نیشانەناسی؛ لێکۆڵینەوەی نموونە یا وێنەی تۆخمێك. (٢) نیشانەکاری.
-typological *(adj.)*.
**tyrannical** (ti-ran′i-k'l, tī-ran′i-k'l), *adj. Also* tyrannic, زۆردار؛ ستەمکار؛ بەزەبر؛ زۆردارەکی.
-tyrannically *(adv.)*; tyrannicalness *(n.)*.
**tyrannicide** (ti-ran′ə-sīd′, tī-ran′ə-sīd′), *n.* (١) زۆردارکوژی؛ ستەمکارکوژی (٢) زۆردارکوژ؛ ستەمکارکوژ
**tyrannize** (tir′ə-nīz′), *v.i.* زۆرداری نواندن؛ ستەمکاری کردن.
*v.t.* زۆرداری کردن؛ ستەمکارانە لەگەڵ جووڵانەوە.
**tyrannosaur** (ti-ran′ə-sôr′, tī-ran′ə-sôr′), *n.* تیرانۆسۆر.

گیاندارێکی زۆر زلی خشۆکی دووپێی گۆشتخۆری قرتێکەوتووە وەك داینەسۆر.

**tyrannous** (tir′ə-nəs), *adj.* ستەمکار، زۆردار

**tyranny** (tir′ə-ni), *n.* (١) ستەمکاری، زۆرداری؛ زوڵم. (٢) ڕژێمێکی ستەمکار یا زۆردار. (٣) توندوتیژی؛ زەبر. (٤) کارێکی ستەمکارانە یا زۆردارانە.

**tyrant** (tī′rənt), *n.* (١) ستەمکار، زۆردار؛ زاڵم. (٢) کەسێکی بەزەبروزەنگ و توندوتیژ.

**tyre** (tīr), *n.* = **tire.**

**tyro** (tī′rō), *n.* *Also* **tiro.** نەوکار، تازەکار، نەشارەزا؛ نەزان

**tyrocidine** (tī′rə-sī′dēn, tī′rə-sī′din), *n.* تیرۆسیدین: دەرمانێکە لە جۆری "پەنسلین"

**tyrosine** (tī′rə-sēn′, tir′ə-sin), *n.* تیرۆسین: ترشێکی ئەمینییە لە شیبوونەوەی پرۆتین پەیدادەبێ

**tzar** (tsär), *n.* = **czar.**

**tzarina** (tsä-rē′nə), *n.* = **czarina.**

**tzigane** (tsē′gan′), *n.* قەرەچ (بەتایبەتی هی هەنگاریا)

# U u

**U, u** (ū), *n.* (١) تیپی بیست‌ویه‌كه‌می ئه‌لف‌وبێی ئینگلیزی‌یه.
(٢) ده‌نگی ئه‌م تیپه: " یو "
(٣) (أ) قالبی ئه‌م تیپه. (ب) ئه‌م تیپه به چاپكراوی یا هه‌ڵكه‌نراوی.
(٤) بیست‌ویه‌كه‌م: نیشانه‌ی ژماره‌ی بیست‌ویه‌كه‌می ڕسته‌یه‌كه.
*adj.* (١) تایبه‌تی به تیپی " u " . (٢) بیست‌ویه‌كه‌م
**U** (ū), *n.* (١) شتێكه له شێوه‌ی " U " دا. (٢) نیشانه‌یه بۆ یورانیۆم (كیمیا).
**ubiquitous** (ū-bik′wə-təs), *adj.* له هه‌موو شوێنێكدایه.
*( ~ fog, little ants, etc.)*
**-ubiquitously** *(adv.)*; **ubiquitousness** *(n.).*
**ubiquity** (ū-bik′wə-ti), *n.* له هه‌موو شوێنێكدا بوون له هه‌مان كاتدا
**U-boat** (ū′bōt′), *n.* ژێرده‌ریایی‌یه‌كی ئه‌ڵمانی؛ ژێرده‌ریایی.
**udder** (ud′ēr), *n.* گوان
**udometer** (ū-dom′ə-tēr), *n.* باران پێو
**-udometric** *(adj.)*; **udometry** *(n.).*
**ugh** (ookh), *interj.* ئۆخ: ده‌نگێكه قێزهاتنه‌وه ده‌رده‌بڕێت.
**uglify** (ug′lə-fī′), *v.t.* ناشرین كردن؛ ڕووخسار ناشرین كردن.
**-uglification** *(n.).*
**ugliness** (ug′li-nis), *n.* (١) ناشرینی؛ ئێسك قورسی؛ چاره‌گرانی
(٢) شتێكی ناشرین. (٣) به‌دی؛ ڕه‌ووشت پیسی؛ ڕه‌ووشت ناشرینی
**ugly** (ug′li), *adj.* (١) ناشرین؛ ئێسك قورس؛ چاره‌گران
(٢) به‌د؛ ناپه‌سه‌ند (ڕه‌ووشت)؛ پیس (كرده‌وه، ڕه‌فتار).
(٣) سامناك؛ ترسناك (٤) [Colloq.]. دڕ؛ شه‌ڕانی؛ شه‌ڕه‌نگێز؛ تووڕه‌وتڕۆ.
**uhlan** (ōō′län, ū′lən, ōō-län′), *n. Also* **ulan,** سه‌ربازی سواره.
**ukase** (ū′kās, ū-kāz′), *n.* (١) فه‌رمانی ئیمپراتۆری ڕوسیای كۆن.
(٢) فه‌رمان
**Ukrainian** (ū-krā′ni-ən, ū-krī′ni-ən), *adj.* ئۆكرانی:
تایبه‌تی به وڵات و گه‌ل و زمانی ئۆكرانیا
*n.* (١) ئۆكرانی: هاونیشتمانی‌یه‌كی ئۆكرانی. (٢) زمانی ئۆكرانی؛ ئۆكرانی.
**ukulele** (ū′kə-lā′li), *n.* یوكه‌لیلی: ئامێرێكی مۆسیقایه وه‌ك گیتار
**-ular** (ū′lēr), پاشگرێكه به‌مانای: په‌یوه‌ندی؛ لێكچوون: *(tubular)*.
**ulcer** (ul′sēr), *n.* (١) خوره: برینی دیواری ڕیخۆڵه، سك یا پێست
(٢) بارودۆخێكی خراپ.
**ulcerate** (ul′sə-rāt′), *v.t. & v.i.* برین لێ هاتن؛ خوره پێ گه‌یین
**ulceration** (ul′sə-rā′shən), *n.* (١) برین لێ هاتن؛ خوره پێ گه‌یین
(٢) ulcer

**ulcerous** (ul′sēr-əs), *adj.* (١) خوره‌یی؛ تایبه‌تی به خوره.
(٢) خوره‌دار؛ خوره‌ی پێ گه‌یبوه یا لێی داوه.
**-ule** (ul), پاشگرێكه به‌مانای: بچووك؛ بچكۆله: *(valvule)*.
**-ulent** (yoo-lənt), پاشگرێكه به‌مانای: پڕه له؛ زۆری تێدایه؛ زۆر:
*(flatulent)*
**ulna** (ul′nə), *n.* (١) ئێسقانی دیوی ناوده‌وه‌ی باسك (كه به‌رامبه‌ری
كه‌له‌موسته له ئانیشكه‌وه تا مه‌چه‌ك). (٢) ئێسقانی به‌رامبه‌ری ئه‌مه له گیانداردا.
**-ulnar** *(adj.).*
**ulotrichous** (ū-lot′ri-kəs), *adj.* قژ لوول.
**-ulous** (yoo-ləs), پاشگرێكه به‌مانای: وه‌هایه؛ پڕه له؛ به‌وه ناسراوه:
*(populous, tremulous)*
**ulster** (ul′stēr), *n.* پاڵتۆیه‌كی ده‌ڵب و ئه‌ستووری ئێرله‌ندی‌یه
**ulterior** (ul-têr′i-ēr), *adj.* (١) دوور؛ هی دوور؛ هی ئه‌ودیو
(٢) دوایی؛ هی دوارۆژ؛ پاشان.
(٣) شاراوه؛ نه‌بینراو؛ ده‌رنه‌بڕاو: *(He had an ~ motive.)*.
**ultima** (ul′tə-mə), *n.* دوا بڕگه‌ی ووشه.
**ultimate** (ul′tə-mit), *adj.* (١) دوورترین
(٢) دوا؛ دواترین؛ كۆتایی: *(the ~ goal, authority, etc.)*
(٣) بنچینه‌یی؛ بناغه‌یی؛ سه‌ره‌تایی
(٤) ئه‌وپه‌ڕ؛ په‌ڕی ئه‌وپه‌ڕ
*n.* (١) بنچینه؛ بناغه؛ شتی بنچینه‌یی. (٢) ئه‌نجام؛ كۆتایی
(٣) ئه‌وپه‌ڕ؛ په‌ڕی ئه‌وپه‌ڕ
**ultimately** (ul′tə-mit-li), *adv.* له ئه‌نجامدا؛ له دواییدا؛ له كۆتاییدا
**ultima Thule,** (١) ناوچه‌ی هه‌ره باكوور. (٢) ناوچه‌ی زۆر دوورو چه‌په.
(٣) (ا) په‌ڕی ئه‌وپه‌ڕ؛ ئه‌وپه‌ڕ. (ب) ئامانج یا شتێكی دوور.
**ultimatum** (ul′tə-mā′təm), *n.* دوا ئاگاداری (به‌تایبه‌تی
له وڵاتێكه‌وه بۆ وڵاتێكی ترو به هه‌ڕه‌شه‌وه)
**ultimo** (ul′tə-mō′), *adv. Abbr.* **ult., ulto.,** مانگی پێشوو
**ultra** (ul′trə), *adj.* په‌ڕگر؛ زۆر توندوتیژ (بیروڕا)؛ زیاده‌ڕۆ.
*n.* كه‌سێكی په‌ڕگر؛ كه‌سێكی زیاده‌ڕۆ
**ultra-** (ul′trə), پێشگرێكه به‌مانای: (١) له‌ولا؛ له‌ژوور؛ له‌وپه‌ڕ:
*(ultraviolet)*
(٢) ئێجگار؛ زۆر؛ له ڕاده به‌ده‌ر: *(ultramodern)*.
(٣) له مه‌ودای ئه‌و به‌ده‌ر یا به‌رزتر: *(ultramicroscopic)*.
**ultraconservative** (ul′trə-kən-sūr′və-tiv), *adj.* زۆر
كۆنه‌په‌رست.
**ultrahigh frequency,** له‌ره‌ی زۆر به‌رز (رادیۆو ته‌له‌فزیۆن).
**ultraism** (ul′trə-iz′m), *n.* (١) زیاده‌ڕۆیی؛ په‌ڕگری
(٢) كارێكی زیاده‌ڕۆیانه یا په‌ڕگرانه
**-ultraist** *(n.).*
**ultramarine** (ul′trə-mə-rēn′), *adj.* (١) (ا) له‌ولای ده‌ریاوه؛
هی ئه‌ودیو ده‌ریا. (ب) كه‌وتووه‌ته ئه‌ودیو ده‌ریاوه.
(٢) شینی ئاسمانی
*n.* (١) ڕه‌نگێكی شینه له به‌ردی لاجی وه‌ردی كوتراو ده‌گیرێت.
(٢) شینی ئاسمانی
**ultramicroscope** (ul′trə-mī′krə-skōp′), *n.* میكرۆسكۆپی
زۆر ووردبین: گه‌ردبینێكه شتی وا وورد ده‌بینێت كه به گه‌ردبینی ئاسایی
نابینرێت.
**ultramicroscopic** (ul′trə-mī′krə-skop′ik), *adj.* (١) هێنده
وورده به گه‌ردبینی ئاسایی نابینرێت. (٢) تایبه‌تی به میكرۆسكۆپی زۆر
ووردبین.
**ultramodern** (ul′trə-mod′ērn), *adj.* فره نوێ؛ زۆر تازه‌باو؛
زۆر تازه‌باو په‌رست
**-ultramodernism** *(n.)*; **ultramodernist** *(n.)*;
**ultramodernistic** *(adj.).*

**ultramontane** (ul´trə-mon´tān), *adj.* (١) (أ) لەوديو شاخەوە (بەتايبەتى شاخى " ئالپ " ). (ب) ئيتالى
(٢) لايەنگرى دەسەلاتى رەهاى پاپا (لە كاروبارى كليسەدا).
*n.* (١) نيشتەجێى ئەوديو شاخ (بەتايبەتى شاخى " ئالپ " ).
(٢) لايەنگرى دەسەلاتى رەهاى پاپا
**ultramundane** (ul´trə-mun´dān), *adj.* (١) لە جيهان بەدەر
(٢) لە كۆمەڵەى خۆر بەدەر.
**ultranationalism** (ul´trə-nash´ən-'l-iz'm), *n.* رەگەزپەرستى لە رادە بەدەر؛ زۆر رەگەزپەرستى.
**-ultranationalist** *(n.)*; **ultranationalistic** *(adj.)*.
**ultraviolet** (ul´trə-vī´ə-lit), *adj.* ژوور بەوەنەوشەيى
*n.* تيشكى سەروو نەوشەيى.
**ultravirus** (ul´trə-vī´rəs), *n.* ڤايرۆسێكە بە ميكرۆسكۆپى زۆر ووردبين نەبينرێ
**ulu** (ōō´lōō), *n.* چەقۆيەكە ژنە ئەسكيمۆيى بەكارى دەهێنن
**ululant** (ūl´yoo-lənt, ul´yoo-lənt), *adj.* لوورەكەر
**ululate** (ūl´yoo-lāt´, ul´yoo-lāt´), *v.i.* (١) لوورەكردن؛ لوورەلووركردن (٢) شيوەن كردن؛ لاواندنەوە
**-ululation** *(n.)*.
**umbel** (um´b'l), *n.* گوڵە چەتر
**umbellate** (um´b'l-it, um´b'l-āt´), *adj.* *Also* **umbellar**, چەترى گوڵ.
**umbelliferous** (um´bə-lif´ēr-əs), *adj.* گوڵ چەترى (كە گێزەرو كەرەوزو ... هتد دەگرێتەوە)
**umbellule** (um´b'l-ūl´, um-bel´ūl), *n.* *Also* **umbellet**, لقى گوڵە چەتر
**umber** (um´bēr), *n.* (١) خاكى قاوەيى (٢) رەنگى قاوەيى.
*adj.* قاوەيى
*v.t.* قاوەيى كردن
**umber** (um´bēr), *n.* (١) [Dial.] ، سێبەر. (٢) ماسىيەكى ناو رووبارە. (٣) umbrette
**umbilical** (um-bil´i-k'l), *adj.* ناوكى؛ تايبەتى بە ناوك؛ ناوك.
**umbilical cord,** (١) ناوكەبەتك (كە ناوكەمەو دايك بەيەك دەگەيەنێت).
(٢) پەيوەندييەكى زۆر گرنگو پێويست.
**umbilicate** (um-bil´ə-kit, um-bil´ə-kāt´), *adj.* (١) ناوكدار؛ ناوكى هەيە (٢) ناوك ئاسا؛ ناوكى؛ لە ناوك دەچێت.
**umbilicus** (um-bil´i-kəs, um´bi-lī´kəs), *n.* (١) ناوك
(٢) چالايى وەك ناوك (زيندەوەرزانى).
**umbles** (um´b'lz), *n.pl.* [Obs.], ناوسكى ئاسكو گياندارى تر (وەك دڵ و جگەرو گورچيلە).
**umbo** (um´bō), *n.* (١) گرێ يا دوگمەى ناوەراستى قەڵغان
(٢) قۆرتى پەردە يا تەپلى گوێ
**-umbonal; umbonic** *(adj.)*.
**umbonate** (um´bə-nit, um´bə-nāt´), *adj.* قۆرتى دوگمەيى؛ قۆرتى وەك گرێ
**umbra** (um´brə), *n.* (١) سێبەر؛ تاريكايى؛ تاريكى؛ سێبەرى خەست
(٢) (ا) تاريكايى سەرزەمين بەهۆى خۆرگيرانەوە.
(ب) تاريكترين بەشى پەڵەى سەر خۆر.
**umbrage** (um´brij), *n.* (١) [Obs. or Poetic.] ، سێبەر؛ تاريكايى.
(٢) لق و پۆپ.
(٣) رق لێ بوونەوە؛ وەرس بوون؛ پێ ناخۆش بوون؛ هەست بريندار بوون:
*( She took ~ at the boss's comment.)*
(٤) (ا) نيشانەى لێل.
(ب) گومان؛ هۆى گومان لێ بوون
**umbrageous** (um-brā´jəs), *adj.* (١) سێبەردار؛ بە سێبەر
(٢) دڵ ناسك؛ گوماندار؛ زوو وەرس دەبێت.
**umbrella** (um-brel´ə), *n.* (١) چەتر. (٢) شتى داپۆشەر يا پارێزەر.
(٣) چەترى هەوايى: بريتييە لە فرۆكەى جەنگى كە لەشكر دەپارێزن لە دوژمن
(٤) رێكخراوێك يا دەزگايەكە كە چەند رێكخراوێكى بچووكتر دەگرێتە ژێر باڵى خۆى: *( an ~ organization)* .
(٥) شتێكى چەتر ئاسا وەك لەشى ماسى ئەرمەليقە.
**umbrella bird,** باڵندە چەترى: باڵندەيەكى رەشى گەورەى ئەمەريكاى لاتينى و ناوەراستى پۆپنە چەترييە.
**umbrella palm,** دارخورماى گەڵا چەترى.
**umbrella tree,** (١) ماگنۆلياى گەڵا چەترى. (٢) دارى گەڵا چەترى.
**umbrette** (um-bret´), *n.* باڵندەيەكى ئەفەريقاييە لە توخمى شينە شاهۆو لەقلەق.
**umbriferous** (um-brif´ēr-əs), *adj.* سێبەردار
**umiak, umiack** (ōō´mi-ak´), *n.* بەلەمێكى بە چەرم داپۆشراوى سەركراوەى ئەسكيمۆييە.
**umlaut** (oom´lout), *n.* ئوملاوت: (١) گۆرينى دەنگى تيپە بزوێن لە زمانە ئەڵمانييەكاندا (بەهۆى لێكدانى دوو تيپە بزوێنەوە):
( Maner, Fusse )
(٢) ئەو تيپە بزوێنەى لەم لێكدانەدا پەيدادەبێت.
(٣) ئەو دوو خاڵەيە كە دەخرێتە سەر ئەم تيپە بزوێنە.
**umpirage** (um´pīr-ij, um´pi-rij), *n.* (١) سەرپشكى؛ نێوكارى سەرپشك؛ ناوبژيكارى. (٢) بريارى سەرپشك.
**umpire** (um´pīr), *n.* سەرپشك (يارى، وەرزش)؛ ناوبژيكار؛ ناوبژيكەر
*v.t.* & *v.i.* سەرپشكى كردن
**umpsteen** (ump´stēn), *adj.* [Colloq.], = **umpteen.**
**umpteen** (ump´tēn), *adj.* [Colloq.], بێ شومار؛ لە ژماردن نايەت.
**umpteenth** (ump´tēnth), *adj.* [Colloq.], بێ شومار؛ لە ژماردن نايەت: *( for the ~ time; He was the ~ person to arrive.)*
**un-** (un), پێشگرێكە بەماناى: (١) دژ؛ پێچەوانە؛ نا؛ بێ:
*( unhappy, untruth, unemployment)*
(٢) بە پێچەوانەوەكردن؛ پووچ كردنەوە؛ نەكردن: *( unfasten)* .
**UN, U.N.,** = **United Nations.**
**unabashed** (un´ə-basht´), *adj.* بەبێ شەرم كردن؛ بێ تەريق بوونەوە؛ بێ نابروو
**-unabashedly** *(adv.)*.
**unabated** (un´ə-bāt´id), *adj.* هيچ بێ هێز نەبووە؛ بە هەمان هێز يا تينەوە؛ بوار نادات: *( ~ violence, zeal, tension, etc.)* .
**unable** (un-ā´b'l), *adj.* بێ توانا؛ لە بارا نەبوو؛ ناتوانێ.
**unabridged** (un´ə-brij´id), *adj.* كورت نەكراوەتەوە (پەرتووك، فەرهەنگ)؛ تەواو.
*n.* فەرهەنگى كورت نەكراوە.
**unaccented** (un-ak´s'nt´id), *adj.* هێز نەخراوە سەر؛ نەگيراو (زمانەوانى): *( an ~ syllable)* .
**unacceptable** (un´ək-sep´tə-b'l), *adj.* پەسەند ناكرێ؛ ناپەسەند؛ نابێ.
**unaccommodated** (un´ə-kom´ə-dāt´id), *adj.* (١) نەگونجاو؛ نەگونجێنراو. (٢) بێ شوێنى حەوانەوە. (٣) دڵ رانەگيراو؛ رازى نەكراو
**unaccompanied** (un´ə-kum´pə-nid), *adj.* (١) هيچ لەگەڵ نەبوو: *( The shipment was ~ by an invoice.)* .
(٢) بەبێ ئەوەى ئاوازى مۆسيقاى لەگەڵ بێت؛ بەتەنها.
**unaccomplished** (un´ə-kom´plisht), *adj.* (١) تەواو نەكراو؛ بەجێ نەهێنراو؛ جێبەجێ نەكراو؛ نەكراو: *( Many tasks remain ~ .)*
(٢) ناكارامە؛ بێ بەهرە؛ نەزان؛ نەشارەزا: *( an ~ artist)* .
**unaccountable** (un´ə-koun´tə-b'l), *adj.* (١) لێل؛ سەير؛ ناچێتە مێشكدا؛ هۆكەى روون نييە. (٢) نا بەرپرسيار؛ لێ نەپرسراوە.

-**unaccountability; unaccountableness** *(n.)*;
**unaccountably** *(adv.)*.

**unaccounted for,** هۆکەی ڕوون نییە؛ ڕوون نەکراوەتەوە؛ لێك نەدراوەتەوە.

**unaccustomed** (un´ə-kus′təmd), *adj.* (١) پێ ڕانەهاتوو: *( ~ to kindness, hardship, cruelty, etc.)*
(٢) نائاسایی: *(~ pleasure)* .

**unadorned** (un´ɔ-dôr′nd), *adj.* سادە: ساکار؛ نەڕازاوە؛ نەنەخشێنراو.

**unadulterated** (un´ə-dul′tə-rā´tid), *adj.* پوخت؛ پاك؛ پەتی؛ ڕووت: هیچی تێکەڵاو نەکراوە؛ گزی تێدا نەکراوە.

**unadvisable** (un´əd-vīz′ɔ-b'l), *adj.* نابەجێ؛ خراپ؛ لە جێی خۆیدا نییە: *(an ~ move)* .

**unadvised** (un′əd-vīzd´), *adj.* (١) ئاگادار نەکراو؛ تەمێ نەکراو؛ ڕابەری نەکراو (٢) هەڵەشە؛ پەلە؛ بیری لێ نەکراوەتەوە؛ ناژیرانە.
-**unadvisedly** *(adv.)*; **unadvisedness** *(n.)*.

**unaffected** (un´ə-fek′tid), *adj.* (١) کارتێنەکراو؛ نەگۆڕاو
(٢) دڵسۆزانە؛ ڕاستەقینە؛ بێ ڕواڵەت یا خۆ نووواندن:
*( He felt ~ grief for her death.)*
-**unaffectedly** *(adv.)*; **unaffectedness** *(n.)*.

**unalloyed** (un´ɔ-loid′), *adj.* (١) پوخت: تێکەڵاو نەکراو (کانزا).
(٢) تەواو؛ لە هیچی کەم نییە: *( ~ success)* .

**unalienable** (un-āl′yən-ə-b'l), *adj.* [Archaic], = **inalienable.**

**unalterable** (un-ôl´tẽr-ə-b'l), *adj.* = **inalterable.**

**un-American** (un´ə-mer′ə-kɔn), *adj.* نا ئەمەریکی؛ لەگەڵ نەریت و بیروڕای ئەمەریکیانەدا ناگونجێت.

**unanimity** (ū´nɔ-nim′ə-ti), *n.* تێکرا: تێکڕایی؛ گشت:
*( the ~ of opinion)*

**unanimous** (yoo-nan′ə-məs), *adj.* بە تێکرا؛ تێکرا؛ بەیەك دەنگ؛ گشتی *(~ vote of the assembly.)*
-**unanimously** *(adv.)*; **unanimousness** *(n.)*.

**unanswerable** (un-an′sẽr-ə-b'l), *adj.* بەربەرچی نادرێتەوە؛ وەڵام نادرێتەوە؛ بە درۆ ناخرێتەوە: *( an ~ argument, claim, etc.)* .

**unapproachable** (un´ɔ-prōch′ɔ-b'l), *adj.* (١) گۆشەگیر؛ سارد: دوورەپەرێز؛ کەس دەمی نایگاتێ. (٢) بێ هاوتا؛ بێ وێنە.

**unapt** (un-apt′), *adj.* (١) نەگونجاو: نابەجێ؛ نەشیاو.
(٢) لەوانە نییە؛ بۆی نییە.
(٣) ناکارامە؛ لێ نەهاتوو؛ نازیرەك؛ کەودەن؛ دەبەنگ.

**unarm** (un-ärm′), *v.t.* [Archaic], = **disarm.**

**unarmed** (un-ärmd′), *adj.* (١) بێ چەك؛ چەك هەڵنەگرتوو.
(٢) بێ درك؛ بێ چڕنووك.

**unassailable** (un´ə-sāl′ɔ-b'l), *adj.* (١) هێرشی نابرێتە سەر؛ ناگیرێت؛ داگیرناکرێت. (٢) بەربەرچی نادرێتەوە؛ بەدرۆ ناخرێتەوە؛ حاشای لێ ناکرێت

**unassisted** (un′ə-sis′tid), *adj.* یاریدە نەدراو؛ بێ یارمەتی.

**unassuming** (un´ə-sōōm′iŋ. un′ə-sūm′iŋ), *adj.* خاکی؛ بێ فیز؛ سەرکز: *(an ~ man)*

**unattached** (un´ə-tacht′), *adj.* (١) نەبەستراوەتەوە؛ نەبەستراو؛ لێك نەدراو (٢) سەربەخۆ؛ بێ پەیوەندی
(٣) ڕەبەن: زگوورتی؛ بێ دەزگیران؛ بێ ژن یا مێرد.

**unattainable** (un´ə-tān′ə-b'l), *adj.* (١) دوورەدەست؛ دەست ناکەوێت؛ دەستی ناگاتێ
(٢) ناتوانرێ بهێنرێتە دی: *( an ~ goal)*

**unattended** (un´ə-ten′did), *adj.* ١ کەس تیایدا ئامادە نەبوو؛ کەس لێ نەبوو: *( an ~ meeting)* .
(٢) لەگەڵ نەبوو: *(a flash of lightning ~ by thunder)* .
(٣) چاودێری نەکراو *( an ~ child, patient, etc.)* .
(٤) بە تەنها: *(The queen was ~ .)* .
(٥) گوێ پێ نەدراو؛ فەرامۆش کراو: *( ~ warning signals)* .
(٦) سەرەوکاری نەکراو: *(an ~ switchboard)*
(٧) نەکراو؛ جێبەجێ نەکراو: *( He left his studies ~ to.)*

**unauthorized** (un´ô′thɔ-rīzd´), *adj.* (١) دەسەڵات پێ نەدراو
(٢) ڕێ پێ نەدراو؛ قەدەغە.

**unavailable** (un´ə-vāl′ɔ-b'l), *adj.* دەست ناکەوێت؛ دوورەدەست.

**unavailing** (un´ə-vāl′iŋ), *adj.* بێ سوود؛ بێ کەڵك

**unavoidable** (un´ə-void′ɔ-b'l), *adj.* خۆی لێ لانادرێت؛ هەر دەبێ ببێ؛ لێ دەربازبوونی نییە.
-**unavoidably** *(adv.)*; **unavoidableness** *(n.)*.

**unaware** (un´ɔ-wâr′), *adj.* (١) بێ ئاگا؛ پێ نەزان:
*( ~ of danger)*
(٢) بێباك؛ بێ دەربەست؛ هەڵەشە.
*adv.*, **unawares.**

**unawares** (un´ə-wârz′), *adv.* (١) بێ دەسەنقەست؛ هەر لەخۆوە.
(٢) لەپڕ؛ لە ناکاو: *( We came upon him ~ .)* .

**unbacked** (un-bakt′), *adj.* (١) نەگیراو (ئەسپ).
(٢) یارمەتی نەدراو؛ پشت نەگیراو. (٣) بێ پاڵپشت (کورسی)

**unbaked** (un-bākt′), *adj.* (١) نەبرژاو (نان).
(٢) کاڵ و کرچ؛ گەڵاڵە نەکراو؛ فەریك (مەجاز)؛ ناتەواو:
*( an ~ plan, idea, etc.)*

**unbalance** (un-bal′əns), *v.t.* (١) لارەسەنگ کردن؛ ناهاوتا کردن؛ هاوسەنگی تێکدان؛ لەنگەر تێکدان. (٢) مێشك تێکدان؛ شێت کردن

**unbalanced** (un-bal′ənst), *adj.* (١) ناهاوتا؛ لارەسەنگ؛ لاسەنگ؛ نارێك (٢) ناهاوتا (دەستمایە، قەرز) (دەفتەرگری).
(٣) (ا) تێکچوو (مێشك)؛ ناتەواو. (ب) شێت.

**unbated** (un-bāt′id), *adj.* (١) **unabated** .
(٢) [Archaic]، نوك کول نەکراو یا دانەپۆشراو (شیری شیربازی)

**unbearable** (un-bâr′ɔ-b'l), *adj.* بەرگەی ناگیرێ؛ لە ووزە بەدەر؛ لەگەڵی دەرنابرێ: *( ~ pain, cruelty, suffering, etc.)* .
-**unbearably** *(adv.)*.

**unbeatable** (un-bēt′ɔ-b'l), *adj.* نابەزێنرێت؛ نەبەزێنراو؛ بۆر پێ نەدراو؛ نادۆڕێت: *( an ~ people, spirit, etc.)*

**unbeaten** (un-bēt′'n), *adj.* (١) نەبەزێنراو؛ نەشکێنراو.
(٢) کەس پیا نەڕۆیشتوو: *(an ~ path)* .
(٣) نەهاڕراو؛ ووردنەکراو.

**unbecoming** (un´bi-kum′iŋ), *adj.* ناشرین (ڕەووشت)؛ نابەجێ؛ لێی نایەت (کردەوە)؛ نەشیاو: *(her ~ behavior)* .

**unbegotten** (un´bi-got′'n), *adj.* (١) هێشتا لەدایك نەبوو.
(٢) لەدایك نەبوو؛ نەمر؛ هەمیشەیی؛ هەتا هەتایی.

**unbeknown** (un´bi-nōn′), *adj.* نەزانراو؛ پێ نەزانراو.
**unbeknown to,** بەبێ ئاگاداری ئەو کەسە؛ بێ ئەوەی کەسەکە پێی بزانێت: *( Unbeknown to me she had planned the trip.)* .

**unbeknownst** (un´bi-nōnst′), *adj.* **unbeknown.**

**unbelief** (un´bɔ-lēf′), *n.* بڕوا نەبوون بە ئاین؛ بێ بڕوایی؛ کفر.

**unbelievable** (un´bə-lēv′ɔ-b'l), *adj.* ستەم؛ ڕێی تێ ناچێت؛ باوەڕی پێ ناکرێت

**unbeliever** (un´bə-lēv′ẽr), *n.* بێ بڕوا (بە ئاین)؛ بێ ئاین؛ خوانەناس؛ کافر.

**unbend** (un-bend′), *v.t.* (١) بەردان (کەوان)؛ بەرەڵاکردن.
(٢) ڕاستکردنەوە (شتی خواروخێچ).

(٣) پشت تێکردنەوە؛ حەوانەوە؛ خاوکردنەوە.
(٤) کردنەوە (پەت)؛ شل کردنەوە.
*v.i.* (١) ڕاست بوونەوە؛ چەوتی تێدا نەمان.
(٢) پشت تێکردنەوە؛ خاوبوونەوە؛ حەوانەوە.
**unbending** (un-ben′diŋ), *adj.* (١) ڕەق؛ نەچەمێنەوە.
(٢) کەللەڕەق؛ ڕای خۆی ناگۆڕێت
**unbiased** (un-bī′əst), *adj.* بێ لایەن
**unbidden** (un-bid′'n), *adj.* (١) نەویستراو؛ داوا نەکراو؛ بانگ نەکراو.
(٢) فەرمان پێ نەدراو.
**unbind** (un-bīnd′), *v.t.* (١) شل کردنەوە؛ کردنەوە.
(٢) بەرەڵاکردن؛ بەردان.
**unbitted** (un-bit′id), *adj.* (١) لغاو نەکراو؛ ڕەشمەی نەکراوەتە سەر.
(٢) بەرەڵا؛ بەر بۆ بەرەڵاکراو؛ ڕێ لێ نەگیراو؛ ڕەها.
**unblemished** (un-blem′isht), *adj.* بێگەرد؛ پاک؛ بێ لەکە.
*( an ~ record of fairness)*
**unblessed** (un-blest′), *adj. Also* **unblest,** (١) پیرۆز نەکراو.
(٢) ناپیرۆز؛ بەد؛ خراپ؛ بەدخوا. (٣) کەساس؛ داماو.
**unblinking** (un-blink′iŋ), *adj.* (١) چاو نەتروکاو.
(٢) بێ هەست؛ هەست مردوو.
(٣) بێ ترس؛ نەترساو؛ نەترس
**unblushing** (un-blush′iŋ), *adj.* (١) بێ شەرم؛ بێ ئابروو؛ بێ حەیا.
(٢) ڕەنگ سوور هەڵنەگەڕاو؛ تەریق نەبووەوە.
**unbodied** (un-bod′id), *adj.* (١) بێ لاشە؛ بێ لەش.
(٢) لە لەش ڕزگار کراو.
**unbolt** (un-bōlt′), *v.t.* کردنەوە (دەرگای داخراو)؛ کلۆم کردنەوە.
**unbolted** (un-bōl′tid), *adj.* کلۆم نەدراو؛ بە کلۆم دانەخراو.
**unbolted** (un-bōl′tid), *adj.* لە هێلەگ نەدراو (ئارد).
**unborn** (un-bôrn′), *adj.* (١) لەدایک نەبووە؛ نەهاتووەتە جیهانەوە.
(٢) داهاتوو؛ پاشەڕۆژ.
**unbosom** (un-booz′əm, un-bōō′zəm), *v.t. & v.i.* دەرخستن؛ دەربڕین؛ درکاندن
**unbosom oneself,** هەست و نەستی خۆ دەربڕین؛ دڵی خۆ هەڵڕشتن.
**unbound** (un-bound′), *past tense and p.p. of* unbind.
*adj.* (١) ئازادکراو؛ بەردراو؛ بەرەڵاکراو؛ ڕزگارکراو.
(٢) بەرگ تێ نەگیراو (پەرتووک)؛ بێ بەرگ.
**unbounded** (un-boun′did), *adj.* (١) بێ سنوور؛ بێ ئەندازە
(٢) بەرەڵا؛ ڕەها
**unbowed** (un-boud′), *adj.* (١) نەچەماوە؛ نەچەمێنراوە؛ نەنوشتاوە.
(٢) دانەنەویو؛ شۆڕنەکراو؛ ملنەدەر. *( My head is bloody but ~ .)* .
**unbrace** (un-brās′), *adj.* (١) کردنەوە (شتی پێچراوە یا شەتەکدراو)؛ بەند یا پێنەست لێکردنەوە. (٢) شل کردنەوە؛ خاوکردنەوە.
(٣) بێ هێز کردن؛ بێ تین کردن.
**unbraid** (un-brād′), *v.t.* خاوکردنەوە (شتی هۆنراوە وەک پرچ).
**unbred** (un-bred′), *adj.* (١) بێ ڕەووشت؛ بەدخوو؛ بەدڕەووشت.
(٢) فێرنەکراو؛ ڕانەهێنراو؛ مەشق دانەدراو.
**unbridled** (un-brī′d'ld), *adj.* (١) بێ لغاو؛ بێ ڕەشمە؛ بێ جڵەو؛ لغاو نەکراو. (٢) بەرەڵا؛ جڵەو بۆ شل کراو؛ ڕەها؛ بێ سنوور.
*( ~ enthusiasm)*
**unbroken** (un-brō′k'n), *adj.* (١) ساغ؛ نەشکاو
(٢) تۆو نەگیراو (ئەسپ). (٣) بەردەوام؛ سەرومر؛ یەکبین.
(٤) ڕێک و پێک
**unbuckle** (un-buk′'l), *v.t.* پشتێن کردنەوە؛ ئاوزوونە کردنەوە یا ترازاندن
**unburden** (un-bûr′d'n), *v.t. ( to ~ a mule)* (١) بار لێ داگرتن؛
(٢) لە کۆڵ (خۆ) کردنەوە؛ بار (ی خۆ) سووک کردن؛ ئەرک لەسەر شان لابردن.
(٣) دەردی دڵ بۆ باس کردن و باری خۆ سووک کردن؛ باری خۆ سووک کردن بە دڵ بۆ هەڵڕشتن. *( He ~ed his soul to a priest.)* .
**unbutton** (un-but′'n), *v.t.* (١) قۆپچە کردنەوە
(٢) دەرخستن؛ هەڵماڵین
**uncage** (un-kāj′), *v.t.* بەردان (لە قەفەز)؛ بەرەڵاکردن.
**uncalled-for** (un-kôld′fôr′), *adj.* (١) ناپێویست؛ پێ نەویست.
(٢) نابەجێ؛ ناڕەوا.
**uncanny** (un-kan′i), *adj.* (١) سەیر؛ نائاسایی؛ تەلیسماوی؛ ناسرووشتی. (٢) ژیر؛ تیژ (ڕێ بەدیی)؛ زۆر چاک؛ لە ئەندازەو سرووشت بەدەر.
*( ~ shrewdness, insight, etc.)*
-uncannily *(adv.)*; uncanniness *(n.)*.
**uncap** (un-kap′), *v.t.* (١) کڵاو (لەسەر) داکەندن.
(٢) سەر هەڵپچڕین (شووشە)؛ سەر قەپاغ لێکردنەوە یا لابردن:
*( to ~ a bottle)*
*v.i.* شەپقە یا کڵاو بۆ داکەندن لە ڕووی ڕێزلێگرتنەوە.
**uncapable** (un-kā′pə-b'l), *adj.* [Obs.]. = incapable.
**uncaused** (un-kōzd′), *adj.* هەر لەخۆیەوە بووە؛ بەبێ هۆ بووە.
**unceasing** (un-sēz′iŋ), *adj.* بەردەوام؛ بێ پایان؛ سەرومر؛ بێ ووچان؛ یەکبین.
-unceasingly *(adv.)*.
**unceremonious** (un′ser-ə-mō′ni-əs), *adj.* (١) نارەسمی:
*( an ~ observance of a holiday)*
(٢) لەپڕو ناشرین (کردەوە)؛ بێ نەزاکەت؛ ڕێزلێنەگر.
-unceremoniously *(adv.)*; unceremoniousness *(n.)*.
**uncertain** (un-sûr′t'n), *adj.* (١) نەزانراو؛ دووبەختی؛ هات‌ونەهات:
*( an ~ outcome)*
(٢) نامسۆگەر؛ نەبڕراوەتەوە: *(~ plans)* .
(٣) دوودڵ؛ ڕارا؛ نادڵنیا؛ گوماندار
(٤) پشت پێ نەبەستراو؛ هەمیشە دەگۆڕێت: *(~ weather)*
(٥) پچڕپچڕ؛ نابەردەوام؛ ناسەرومر؛ ناهەمیشە.
**uncertainty** (un-sûr′t'n-ti), *n.* (١) (ا) گومان. (ب) دوودڵی؛ دڵەڕاوکێ؛ نادڵنیایی. (٢) هات‌ونەهات؛ دووبەختی؛ مەترسی.
(٣) شتێکی نامسۆگەر یا گوماناوی؛ شتێکی دووبەختی یا هات‌ونەهات.
**unchangeable** (un-chān′jə-b'l), *adj.* گۆڕینی بۆ نییە؛ ناگۆڕێت
**uncharitable** (un-char′ə-tə-b'l), *adj.* نابەخشندە؛ دڵڕەق؛ لێ نەبووردوو.
-uncharitably *(adv.)*.
**uncharted** (un-chär′tid), *adj.* نەدۆزراوە؛ نەزانراو؛ بێ نەخشە؛ ڕێ پیادا نەبراو: *(an ~ territory, field of knowledge, etc.)*
**unchaste** (un-chāst′), *adj.* داوێن پیس.
**unchristian** (un-kris′chən), *adj.* (١) خاچ پەرست نییە.
(٢) بە پێچەوانەی ڕێبازو ڕەفتاری خاچ پەرستی‌یە.
(٣) نامرۆڤانەیە؛ کێوی؛ لە خاچ پەرستان ناوەشێتەوە؛ ناشرین (کردەوە، ڕەفتار)
**unchurch** (un-chûrch′), *v.t.* (١) لە ئەندامێتی کڵێسە دەرکردن
(٢) پێکهێنانی کڵێسە قەدەغەکردن لە کۆمەڵێک خەڵک.
**uncial** (un′shi-əl, un′shəl), *adj.* تایبەتی بە تیپی ئینچی، واتە گەورە (کە بەکاردەهێنرا لە دەستنووسی یۆنانی و ڕۆمانی کۆندا)
*n.* (١) تیپێکی ئینچی، واتە گەورە. (٢) دەستنووسی بەم جۆرە تیپە نووسراو.
**unciform** (un′si-fôrm′), *adj.* قولاپی؛ سەرچەماوە
**uncinal** (un′si-n'l), *adj.* uncinate.
**uncinaria** (un′si-nə-rī′ə), *n.* = hookworm.
**uncinariasis** (un′si-nə-rī′ə-sis), *n.* = ancylostomiasis.
**uncinate** (un′si-nit, un′si-nāt′), *adj.* قولاپی؛ سەرچەماوە.
**uncinus** (un′si-nəs), *n.* شتێکی قولاپی یا سەرچەماوە.

**uncircumcised** (un-sûr′kəm-sīzd′), *adj.* (١) خەتەنە نەكراو.
(٢) گاور (٣) بت پەرست؛ بێ ئاین.

**uncivil** (un-siv′'l), *adj.* (١) كێوی؛ ناشارستانی.
(٢) بێ ئەزاكەت: ناشرین؛ بێ ڕەووشت: ***(~ behavior)***.

**uncivilized** (un-siv′'l-īzd′), *adj.* كێوی: ناشارستانی؛ دڕندە.

**unclad** (un-klad′), *alternative past tense and past-participle of* **uncloth.**
***adj.*** ڕووت: ڕووت‌وقووت.

**unclasp** (un-klasp′, un-kläsp′), *v.t.* (١) كردنەوە (قولفە، ئاوزوونە، زنجیر، مستەكۆڵە، چنگ)؛ ترازاندن؛ شل كردنەوە.
(٢) لە چنگ دەرهێنان؛ لە دەست كردنەوە یا بەرەڵاكردن
***v.i.*** (١) كرانەوە؛ شل بوونەوە.
(٢) دەست لەیەك دەرهێنان یا كردنەوە؛ چنگ لێك جیاكردنەوە.

**unclassified** (un-klas′ə-fīd′), *adj.* (١) پۆل پۆل نەكراو؛ هاوبابەت نەكراو (٢) نانهێنی (هەواڵ، ڕاپۆرت)

**uncle** (uŋ′k'l), *n.* (١) مام؛ خاڵ؛ لالۆ (٢) مێردی پوور.
(٣) [Colloq.]. مام (نازناوی ڕێزە بۆ پیاوی بەتەمەن)؛ مامە.
(٤) [Slang]. **pawnbroker**

**unclean** (un-klēn′), *adj.* (١) پیس: پیس‌و پۆخڵ؛ چڵكن
(٢) چەپەڵ: بۆگەن: پیس‌و بۆگەن؛ ناپاك. (٣) داوێن پیس.

**uncleanly** (un-klēn′li), *adj.* (١) پیس: پیس‌و پۆخڵ
(٢) داوێن پیس: ناپاك

**-uncleanliness** ***(n.).***

**uncleanly** (un-klēn′li), ***adv.*** (١) بە پیس‌و پۆخڵانە.
(٢) بە داوێن پیسانە؛ بە ناپاكی‌یانە

**unclear** (un-klêr′), *adj.* لێڵ؛ نادیار

**unclench** (un-klench′), *v.t.* كردنەوە (مستەكۆڵە، چنگ، زرێزە...)؛ شل كردنەوە؛ ترازاندن: ***(to ~ one's fists)***.
***v.i.*** كرانەوە؛ كردنەوە؛ شل بوونەوە؛ ترازان.

**Uncle Sam,** [Colloq.]. مامە سام: ئەمەریكا؛ ڕژێمی ئەمەریكا

**Uncle Tom,** مامە تۆم (١) ناوی قولەڕەشێكی چیرۆكێكی ئەمەریكی‌یە.
(٢) قولەڕەشێكی چڵكاوخۆرو كڕنووش بەر بۆ ڕەگەزی سپی ئەمەریكا؛ قولەڕەشی نۆكەرو سەرشۆڕ.
(٢) چڵكاوخۆر؛ نۆكەر؛ سەرشۆڕ؛ كڕنووش بەر

**unclinch** (un-klinch′), *v.t.* = **unclench.**

**uncloak** (un-klōk′), *v.t.* (١) عەبا داكەندن: جبە داكەندن
(٢) دەرخستن؛ خستنەڕوو؛ هەڵماڵین

**unclose** (un-klōz′), *v.t.* (١) كردنەوە.
(٢) خستنەڕوو؛ پیشاندان؛ دەرخستن.

**unclothe** (un-klōth′), *v.t.* ڕووتكردنەوە: حل لەبەر داكەندن.

**uncoil** (un-koil′), *v.t.* خاوكردنەوە؛ ڕەواندنەوە؛ ڕاستكردنەوە.
***v.i.*** خاوبوونەوە؛ ڕەوانەوە؛ ڕاستبوونەوە

**uncomfortable** (un-kum′fẽr-tə-b'l), *adj.* (١) ناڕەحەت؛ ناخۆش ***(an ~ chair, situation, etc.)***.
(٢) بێ ئارام؛ پەست؛ ناڕەحەت

**-uncomfortably** ***(adv.).***

**uncommercial** (un′kə-mûr′shəl), *adj.* (١) لە بازرگانی بەدەر؛ پەیوەندی نی‌یە بە بازرگانی‌یەوە. (٢) لەگەڵ ڕێڕەو پەیڕەوی بازرگانیدا نەگونجاو

**uncommitted** (un′kə-mit′id), *adj.* بەڵێن نەدەر؛ پەیمان نەدەر؛ بێ پەیوەندی؛ سەربەست. ple

**uncommon** (un-kom′ən), *adj.* (١) نائاسایی؛ دەگمەن؛ بە دەگمەن ڕێ كەوتوو. (٢) هەڵكەوتوو؛ سەرئاسا؛ نایاب.

**-uncommonly** *(adv.).*

**uncommunicative** (un′kə-mū′nə-kā′tiv), *adj.* كەم دوو؛ نەدوو؛ بێ دەنگ.

**uncomplimentary** (un-kom′plə-men′tẽr-i), *adj.* سووك (سەرنج)؛ ناشرین؛ لە ڕێز كەمكەرەوە:
***(He made some ~ remarks about her.)***

**uncompromising** (un-kom′prə-mīz′iŋ), *adj.* سەرسەخت؛ كەللەڕەق؛ ڕەق؛ هەڵوێست‌و بیروڕای خۆی ناگۆڕێت.

**unconcern** (un′kən-sûrn′), *n.* (١) بە تەنگەوە نەهاتن؛ بەدەربەستەوە نەهاتن؛ بێباكی. (٢) ناسوودەیی؛ بێ مەراقی؛ بێ خەمی.

**unconcerned** (un′kən-sûrnd′), *adj.* (١) بە تەنگەوە نەهاتوو؛ بەدەربەستەوە نەهاتوو؛ بێباك. (٢) بێ خەم؛ بێ مەراق؛ ناسوودە.

**unconditional** (un′kən-dish′ən-'l), *adj.* (١) بێ مەرج؛ بێ چەندو چۆن: ***(an ~ surrender)***.
(٢) تەواو؛ بێ مەرج: ***(He has her ~ support.)***.

**unconditionally** (un′kən-dish′ən-'l-i), *adv.* (١) بێ مەرج؛ بێ چەندو چۆن. (٢) بە تەواوی.

**unconditioned** (un′kən-dish′ənd), *adj.* (١) بێ مەرج؛ بێ چەندو چۆن (٢) زگماكی؛ هەر لە خۆوە نەك بە ڕاهێنان یا فێركردن
***(an ~ reflex)***

**unconnected** (un′kə-nek′tid), *adj.* (١) بێ پەیوەندی؛ پچڕاو؛ پێوە نەبەستراو (٢) پچڕپچڕ؛ پەیوەندی بە یەكتری‌یەوە نی‌یە.

**unconquerable** (un′koŋ′kẽr-ə-b'l), *adj.* نابەزێت؛ نەبەز؛ نابەزێنرێت.

**unconscionable** (un-kon′shən-ə-b'l), *adj.* (١) بێ ویژدان؛ ناڕەوا. (٢) لە ئەندازە بەدەر؛ زیادەڕۆ؛ نابەجێ

**-unconscionableness** ***(n.)***; **unconscionably** ***(adv.).***

**unconscious** (un-kon′shəs), *adj.* (١) (ا) بێ گیان؛ بێ هۆش؛ بێ هەست؛ بێ مێشك. (ب) بووراوە؛ لە هۆش خۆ چوو؛ بێ هۆش.
(ج) هەست پێ نەكراو؛ پێ نەزانراو؛ بێ ئاگا؛ پێ نەزان:
***(He was ~ of his mistake.)***
(٣) بەبێ دەسەنقەست؛ لەخۆوە: ***(an ~ insult, act, reaction)***
(٤) ناهۆشیار؛ هی هەستی شاراوە.

**-unconsciously** ***(adv.)***; **unconsciousness** ***(n.).***

**the unconscious,** هەستی ناهۆشیار (دەروونناسی)؛ هەستی شاراوە؛ بیرو هۆش‌و هەست‌و ئەست‌و حەزی خۆ پێ نەزان.

**unconsidered** (un′kən-sid′ẽrd), *adj.* (١) ڕەچاو نەكراو؛ بایەخ پێ نەدراو؛ حساب بۆ نەكراو. (٢) بیر لێ نەكراوە؛ هەڵەشانە:
***(a hasty, ~ remark)***

**unconstitutional** (un′kon-stə-tōō′shən-'l, un′kon-stə-tū′shən-'l), *adj.* نادەستووری؛ بە پێچەوانەی دەستوور.

**-unconstitutionality** ***(n.)***; **unconstitutionally** ***(adv.).***

**uncontrollable** (un′kən-trōl′ə-b'l), *adj.* دابین نەكراو؛ دابین ناكرێت؛ جڵەوی ناگیرێت؛ ڕاناگیرێت.

**unconventional** (un′kən-ven′shən-'l), *adj.* نەگونجاو لەگەڵ نەریت‌و ڕەووشت‌و ڕێبازی باودا.

**-unconventionality** ***(n.)***; **unconventionally** ***(adv.).***

**uncork** (un-kôrk′), *v.t.* (١) تەپەدۆر لێ دەرهێنان؛ كردنەوە (شووشە‌شەراب). (٢) ئاشكراكردن؛ بەرەڵاكردن؛ سەر لێ لابردن: ***(to ~ a secret)***.

**un-co-ordinated** (un′kō-ôr′də-nā′tid), *adj.* ناڕێكوپێك؛ ناتوانێت پێكەوەو بە باشی بەكاری بهێنێت (دەست).

**uncounted** (un-koun′tid), *adj.* (١) نەژمێرراو.
(٢) بێ شومار؛ لە ژماردن نایەت؛ لێجگار زۆر.

**uncouple** (un-kup′'l), *v.t.* (١) لێككردنەوە؛ لە یەكتر جیاكردنەوە یا ترازاندن ***(to ~ railroad cars)***
(٢) بەرەڵاكردن؛ بەردان؛ پەت لە مل كردنەوە (سەگ).
*v.i.* بەربوون؛ بەرەڵابوون

**uncouth** (un-kōōth′), *adj.* (١) [Rare]، سەیر؛ نەزانراو؛ نەناسراو؛ باو نییە (٢) کەرتر؛ چوارپێ؛ کێوی؛ بێ نەزاکەت.

**uncover** (un-kuv′ēr), *v.t.* (١) ئاشکرا کردن؛ دەرخستن؛ خستنەڕوو؛ هەڵماڵین (٢) سەر (لێ) لابردن؛ ڕووتکردن؛ سەرقاپ لەسەر لادان؛ سەرهەڵدانەوە (٣) کڵاو یا شەپقە لەسەر داکەندن (لە ڕووی ڕێزلێگرتنەوە).

*v.i.* (١) کڵاو یا شەپقە لەسەر داکەندن (لە ڕووی ڕێزلێگرتنەوە). (٢) سەرقاپ لەسەر لادان؛ سەر (لێ) لابردن؛ سەرهەڵدانەوە.

**uncovered** (un-kuv′ērd), *adj.* (١) نەپۆشراو. (٢) بیمەی نییە؛ بێ بیمە؛ پاراستنی بیمەی نییە (٣) سەر ڕووت.

**uncreated** (un′krē-āt′id), *adj.* (١) هێشتا دروست نەبووە یا نەهاتووەتە جیهانەوە. (٢) هەر هەبووەو هەر دەیشبێت؛ هەتا هەتایی؛ لە خۆیەوە هاتووەتە جیهانەوە.

**uncross** (un-krôs′), *v.t.* قاچ لەسەر قاچ لابردن:
*( She ~ed her legs.)*

**unction** (uŋk′shən), *n.* (١) چەورکردن (بۆ مەبەستی ئاینی یا پزیشکەوانی)؛ ڕۆن لێدان؛ مەڵحەم لێدان. (٢) ڕۆن؛ مەڵحەم. (٣) بەلسەم؛ شتێکی خۆش بۆ دڵو گیان یا بۆ لەش. (٤) بەپەرۆشی یا بەجۆشییەکی ڕواڵەت (لە دوواندا).

**unctuous** (uŋk′chōō-əs), *adj.* (١) چەور؛ ڕۆناوی؛ ڕۆندار. (٢) لووس؛ خز (٣) زمان لووس؛ مەراییکەر؛ بە ڕواڵەت دڵسۆز.

**-unctuously** *(adv.)*; **unctuousity**; **unctuousness** *(n.)*.

**uncurl** (un′kūrl), *v.t.* ڕاستکردنەوە (شتی لوول وەك قژ).
*v.i.* ڕاستبوونەوە؛ خاوبوونەوە؛ لوول تێدا نەمان

**uncus** (uŋ′kus), *n.* ئەندامی چەماوە یا قولاپی.

**uncut** (un-kut′), *adj.* (١) نەبڕاو (٢) پەڕەکانی نەبڕاوە، واتە لەیەك نەکراوەتەوە (پەرتووکی تازە). (٣) بە ڕێك وپێکی نەبڕاو (گەوهەر). (٤) کورت نەکراوەتەوە (پەرتووك، فیلم).

**undamped** (un-dampt′), *adj.* (١) دڵی سارد نەبووەتەوە.
*( Her enthusiasm was ~ .)*
(٢) نەوەستاوە (لەرەی کارەبایی).

**undaunted** (un-dôn′tid, un-dän′tid), *adj.* چاونەترساو؛ نەبەرد؛ بێباك؛ ئازا:
*( U~ by failure and misfortune, he kept on.)*

**-undauntedly** *(adv.)*; **undauntedness** *(n.)*.

**undecided** (un′di-sīd′id), *adj.* (١) بڕیار (لەسەر) نەدراو؛ نەبڕاوەتەوە (٢) دوودڵ؛ بڕیاری نەداوە.

**undefined** (un′di-fīnd′), *adj.* دیاری نەکراو.

**undemonstrative** (un′di-mon′strə-tiv), *adj.* هەستی خۆ پیشان نەدەر؛ نەدوو.

**undeniable** (un′di-nī′ə-b′l), *adj.* (١) بە درۆ نەخرێتەوە؛ ڕاست؛ بەرپەرچ نادرێتەوە (٢) زۆرباش؛ نایاب

**-undeniably** *(adv.)*.

**under** (un′dēr), *prep.* (١) لەژێر *( His shoes are ~ the bed.)*.
(٢) لەبن؛ لەخوار؛ لەژێر. *( ten feet ~ water)*.
(٣) (ا) لەژێردەست (پلەوپایە)؛ لەخوار. (ب) لەژێر (نرخ)؛ کەمتر.
(ج) لەخوار (تەمەن): *( ~ age)*.
(٤) لە بارودۆخێکی تایبەتیدا:
*( He is ~ an anesthetic.; The house is ~ repair.)*
(٥) بە ئامۆژگاری کەسێك:
*( He studied music ~ a famous composer.)*
(٦) لە چەرخی؛ لەکاتی
*( Literature flourished ~ the new regime.)*
(٧) لەژێر؛ لە *( the question ~ discussion)*.
(٨) لە؛ لەبەر؛ بەهۆی: *( ~ the circumstances)*.
(٩) بەگوێرەی؛ بەپێی: *( ~ the rules)*

*adv.* (١) لەژێر؛ لەبن. (٢) لە خوار؛ لەژێردەست. (٣) کەمتر.
*adj.* (١) ژێرەوە؛ هی ژێرەوە. (٢) ژێردەست؛ خواردەست. (٣) کەمتر.

go under, ژێرکەوتن (بازرگانی، کاسبی)؛ بە ئاخدا چوون.

**under-** (un′dēr), پێشگرێکە بەمانای: (١) ژێر؛ ژێرەوە:
*( undershirt)*
(٢) ژێردەست؛ خواردەست.
(٣) کەمتر.

**underachieve** (un′dēr-ə-chēv′), *v.i.* کەم توانا بوون (لە ئیش یا خوێندندا)؛ نازیرەك بوون.

underachiever *(n.)*.

**underage** (un′dēr-āj′), *adj.* خوارتەمەن؛ منداڵتر لە هەژدە ساڵ (بۆ دەنگدان یا خواردنەوە)

**underarm** (un′dēr-ärm′), *adj.* هی بن باڵ.
*n.* بن باڵ؛ بن قۆڵ.

**underbid** (un′dēr-bid′), *v.t. & v.i.* نرخی کەمتر پێشکەش کردن لە خەڵك (مەزاد).

-underbidder *(n.)*.

**underbred** (un′dēr-bred′), *adj.* (١) بێ ڕەووشت؛ بێ نەزاکەت. (٢) ناڕەسەن؛ دووڕەگ.

**underbrush** (un′dēr-brush′), *n.* گژوگیاو بنچکی ژێر درەختی دارستان. (هەروەها: " **undergrowth** ").

**underbuy** (un′dēr-bī′), *v.t.* (١) بە هەرزانتر کڕین لە نرخی خۆی. (٢) بە هەرزانتر کڕین لە خەڵك.

**undercarriage** (un′dēr-kar′ij), *n.* (١) چوارچێوەی ژێر ئوتومبیل. (٢) تایەو کەرەسەی نیشتنەوەی فڕۆکە.

**undercharge** (un′dēr-chärj′), *v.t.* (١) پارە کەم (یا کەمتر) لێ سەندن: *( The grocer ~s us.)*. (٢) فیشەك کەم تێخستن؛ داگرتنەوە بە گوللەی کەم.
*n.* (١) فیشەك یا گوللەی کەم لە چەکدا. (٢) کرێ یا پارە کەم سەندن.

**underclassman** (un′dēr-klas′mən), *n.* = **lowerclassman.**

**underclothes** (un′dēr-klōz′, un′dēr-klōthz), *n.pl.* جلی-ژێرەوە.

**underclothing** (un′dēr-klōth′iŋ), *n.* = **underclothes.**

**undercoat** (un′dēr-kōt′), *n.* (١) چاکەتی ژێرەوە. (٢) تووکی کورتی ژێرەوەی گیانەوەر. (٣) چینە سواغ یا بۆیەی ژێرەوە.
*v.t.* چینێك سواغ یا بۆیەی ژێرەوە لێدان.

**undercover** (un′dēr-kuv′ēr), *adj.* نهێنی؛ پەنهانی؛ سووسەیی:
*( an ~ investigation; an ~ agent)*

**undercroft** (un′dēr-krôft′, un′dēr-kroft′), *n.* ژووری-ژێرزەمین (بەتایبەتی هی کڵێسە).

**undercurrent** (un′dēr-kūr′ənt), *n.* (١) تەووژمی ژێر ئاو؛ تەووژمی شاراوەی ژێر ئاو. (٢) هەست و بیروڕای شاراوە (کە دژ بەوەیە کە لەڕووە):
*( Although everybody seemed to support the government, there was an ~ of opposition.)*

**undercut** (un′dēr-kut′), *n.* (١) بن کەنی. (٢) لەلەیەکە لەخوار شوێنی بڕینەوەی درەختێکداو لەو لایەی کە دەویسترێ درەختەکەی بۆ بکەوێت (٣) [Chiefly British]، پارچە گۆشتی پشتەمەغزە. (٤) لێدانی ژێر تۆپ (گۆڵف، تەنس).
*adj.* بن کەن کراو.
*v.t.* (١) بن کەن کردن. (٢) لەژێرەوە زیان لێدان. (٣) لەلەکردنی درەختێك لەخوار شوێنی بڕینەوەکەیداو لەو لایەی کە دەویسترێ درەختەکەی بۆ بکەوێت. (٤) بە پارەی کەمتر ئیش کردن لە خەڵکی تر؛ بە هەرزانتر شت فرۆشتن لە فرۆشیاری تر.

(٥) لەژێری توێ دان (گۆلف، تەنس).
*v.i.* بن کەن کردن
**underdeveloped** (un´dēr-di-vel′əpt), *adj.* (١) گەشەنەکردوو؛
ناتەواو؛ لە ئاسایی بچووکتر. *( an ~ muscle, mind, body, etc.)* .
(٢) باش نەشۆراوە (وێنە): *(an ~ picture)*
(٣) دواکەوتوو؛ پەرەنەسەندوو: *( ~ countries)*
**underdo** (un´dēr-do͞o′), *v.i. & v.t.* (١) کەم نش کردن.
(٢) کەم کوڵاندن، برژاندن، یا سوورکردنەوە:
*( She underdid the meat.)*
**underdog** (un′dēr-dôg´), *n.* (١) دۆڕاو (پێشبڕکێ)؛
چاوەڕێی دۆڕان لێ کراو. (٢) ژێردەستە؛ بارکەوتوو.
**underdone** (un′dēr-dun´), *adj.* نەکوڵاو (بەتایبەتی گۆشت)؛
نەبرژاو؛ نەبوو
**underdrawers** (un′dēr-drôrz´), *n.pl.* دەرپێی درێژ (پیاوانە).
**underdress** (un´dēr-dres′), *v.i.* جلی سادەتر لەبەرکردن
لە پێویست.
**underdressed** (un′dēr-drest´), *adj.* جلی سادەتر لەبەرکردوو
لەوەی کە پێویستە.
**underestimate** (un´dēr-es′tə-māt´), *v.t. & v.i.* (١) بە کەمتر
نرخ دانان؛ بە کەمتر هەڵسەنگاندن؛ بە کەمتر قەبلاندن.
(٢) بە سووک دانان؛ بە کەم دانان؛ بە کەمتر دانان؛ بە ئاسان دانان:
*( to ~ an enemy; to ~ a task)*
***n.*** قەبلاندنێکی بە کەم؛ هەڵسەنگاندنێکی بە کەم
**-underestimation** *(n.)*.
**underexpose** (un´dēr-ik-spōz′), *v.t.* کەم دانەبەر ڕووناکی
(فیلمی کامێرا)
**underexposure** (un´dēr-ik-spō′zhēr), *n.* کەم دانەبەر ڕووناکی
(فیلمی کامێرا)
**underfeed** (un´dēr-fēd′), *v.t.* (١) خواردن کەم پێدان.
(٢) سووتەمەنی لەژێرەوە تێکردن.
**underfoot** (un´dēr-foot′), *adv.* (١) لەژێر پێدا؛ لەسەر زەوی؛
لەژێر دەست و پێدا. (٢) ڕێگەی گرتووە؛ لەبەر پێدایە.
***adj.*** (١) لەژێر پێدا؛ لەبەر پێدا؛ لەسەر زەوی.
(٢) پێشێل؛ پێ پەست؛ پێشێل کراو
**underfur** (un′dēr-fûr´), *n.* تووکی نەرمی ژێرەوەی گیانەوەر
**undergarment** (un′dēr-gär´mənt), *n.* جلی ژێرەوە
**undergird** (un′dēr-gûrd´), *v.t.* شت دانەبەر و بەهێزکردن
**undergo** (un´dēr-gō′), *v.t.* بەسەرداهاتن؛ چەشتن (ناخۆشی)؛
نۆشین. *( They underwent a lot of suffering.)* .
**undergraduate** (un´dēr-graj′o͞o-it), *n.* قوتابی زانکۆ (کە بۆ
بەکالۆریۆس دەخوێنێت).
***adj.*** (١) تایبەتی بە خوێندنی بەکالۆریۆس.
(٢) تایبەتی بە پلەی قوتابی بەکالۆریۆس.
**undergound** (un′dēr-ground′), *adj.* (١) ژێرزەمینی.
(٢) نهێنی؛ پەنهانی. *(an ~ organization)* .
***adv.*** (١) لە ژێرزەمیندا؛ ژێرزەمینی. (٢) بە دزییەوە؛ بە پەنهانی.
***n.*** (١) ناوچەی ژێر زەمین
(٢) ڕاڕەوی ژێر زەمین؛ جێگەی ژێر زەمین
(٣) ڕێکخراو یا حیزبی نهێنی: *( He worked in the ~ of France.)* .
(٤) [British]. شەمەندەفەری ژێر زەمین؛ هێڵی ئاسنی ژێر زەمین.
(کورتەیە بۆ " **underground railway** ")
**underground railroad,** ڕێگەی ئاسنی ژێر زەمین؛
شەمەندەفەری ژێر زەمین. (هەروەها " **underground railway** ").
**undergrown** (un′dēr-grōn´), *adj.* بچووک؛ لە ئاسایی بچووکتر.
**undergrowth** (un′dēr-grōth´), *n.* (١) **underbrush** .

(٢) **undercoat # 2** (٣) بچووکی؛ لە ئاسایی بچووکتر بوون.
**underhand** (un′dēr-hand´), *adj.* (١) بە دەست کراو لە ژێرەوە.
(٢) نهێنی؛ دزی؛ پەنهانی؛ چەوت؛ لە ژێرەوە؛ فێڵباز؛ زۆڵ.
***adv.*** (١) بە دەست کراوە لە ژێرەوە
(٢) بە نهێنی؛ بە پەنهانی؛ بە فێڵبازی؛ لە ژێرەوە؛ بە زۆڵانە.
**underhanded** (un′dēr-han′did), *adj.* (١) نهێنی؛ چەوت؛ دزی؛
لە ژێرەوە (بە نیازی فێڵ و گزی کردنەوە):
*( an ~ operation, move, act, etc.)*
(٢) کرێکاریان کەمە؛ یاریکەریان کەمە.
**-underhandedly** *(adv.)*; **underhandedness** *(n.)*.
**underhung** (un′dēr-huŋ´), *adj.* (١) دەرپۆقیو (کاژێری خوارەوە)؛
داکەوتوو (٢) کاژێر دەرپۆقیو یا داکەوتوو. (٣) بە ژێریەوە هەڵواسراوە
(٤) لەسەر هێڵی ئاسن وەستاوە یا دێت و دەچێت.
**underlaid** (un′dēr-lād´), *adj.* (١) خراوەتە ژێری؛ لە ژێریدا دانراوە.
(٢) پاڵپشتی لەژێردایە؛ بەرزکراوەتەوە یا ڕاگیراوە بە شتێک.
**underlay** (un′dēr-lā´), *n.* (١) پارچەیەک کاغەزە دەخرێتە ژێر تیپی
چاپنووسەوە بۆ بەرزکردنەوەی. (٢) ڕاخەری ژێر بەڕەو فەرش (وەک
حەسیر... هتد).
***v.t.*** (١) شت خستنەژێر بۆ پاڵپشت یا بەرزکردنەوە. (٢) ژێر داپۆشین
(٣) بەرزکردنەوە یا پاڵپشت کردن بە شت خستنەژێر.
**underlay** (un′dēr-lā´), *past tense of* **underlie.**
**underlet** (un´dēr-let′), *v.t.* (١) بە هەرزانتر بە کرێدان لە کرێی
ئاسایی. (٢) **sublet** .
**underlie** (un´dēr-li′), *v.t.* (١) لەژێریدا بوون.
(٢) بوون بە بناغە بۆ؛ بنچینە بوون بۆ:
*( ideas ~ing the revolution; Many facts ~ my decision.)*
(٣) [Obs.]، خوارتر بوون لە (پلەوپایە، گرنگی)؛ نزمتر بوون لە
(٤) لەپێشتر بوون؛ ماف زیاتر بوون لە (دارایی)؛ گرنگتر بوون لە.
*( This claim ~s that.)*
**underline** (un′dēr-lin´), *v.t.* (١) هێڵ بە ژێردا هێنان (ووشە، ڕستە).
(٢) دووپاتکردنەوە (لەبەر گرنگی): *( to ~ a point in a discussion)*
***n.*** هێڵی بە ژێردا هێنراو (بۆ سەرنج ڕاکێشان و گرنگی دەرخستن).
**underling** (un′dēr-liŋ), *n.* بەردەست؛ نۆکەر؛ چڵکاوخۆر؛
ژێردەست؛ خواردەست.
**underlip** (un′dēr-lip´), *n.* لچ.
**underlying** (un′dēr-lī´iŋ), *adj.* (١) هی ژێرەوە؛ لەژێر.
(٢) بنچینەیی؛ بناغەیی. (٣) نادیار؛ لێڵ؛ نائاشکرا.
(٤) لەپێشتر (مافی دارایی)؛ گرنگتر؛ بەرتر.
**undermine** (un′dēr-mīn´), *v.t.* (١) بن کەن کردن؛ لەغەم لێدان
لە ژێرەوە. (٢) بن کەن کردن و ڕووخاندن؛ تێکدان؛ هەڵوەشاندن:
*( Water ~d the stone foundation.)*
(٣) (ا) زیان لێدان (بە دزییەوە)؛ هەوڵی ڕووخاندن دان (بە نهێنی)؛ لاوازکردن:
*( They are ~ing the president's authority.)*
(ب) وورده وورده لاوازکردن؛ زیان لێدان؛ تێکدان:
*( Drink is ~ing his health.)*
**undermost** (un′dēr-mōst´), *adj.* ژێرترین؛ خوارترین.
**underneath** (un´dēr-nēth′, un´dēr-nē*th*′), *adv.* (١) لەژێر؛
لەبن. (٢) لە دیوی ژێرەوە.
*prep.* (١) لەژێر؛ لەخوار: *( Write the date ~ the address.)* .
(٢) لەژێر دەسەڵات یا ڕکێفدا؛ خواردەست؛ ژێردەست
*adj.* لەژێر؛ لەخوار؛ ژێر
***n.*** دیوی ژێرەوە؛ لای خواروو
**undernourish** (un´dēr-nûr′ish), *v.t.* خواردن کەم پێدان؛
گەندە خواردەمەنی پێدان.
**-undernourished** *(adj.)*.

**undernourishment** (un´dēr-nŭr′ish-mənt), ***n.*** بەدخۆری؛ کەم خۆراکی؛ گەندەخۆری؛ شتی باش نەخواردن.
**underpants** (un′dēr-pants´), ***n.pl.*** دەرپێ
**underpass** (un′dēr-pas´, un′dēr-päs´), ***n.*** ڕێگەی ژێر پرد؛ ڕێگەی ژێر ڕێگەی بەرزی تر یا ژێر هێڵی شەمەندەفەر.
**underpay** (un´dēr-pā′), ***v.t.*** کرێ کەم دان؛ کرێ کەمتر پێدان لە خەڵك.
**underpin** (un′dēr-pin´), ***v.t.*** (١) بنچینەی دیوارو خانوو بەهێزکردن؛ دارو کۆڵەکەو بەرد دانەبەر دیوار؛ پتەوکردن. (٢) پاڵپشتی کردن؛ لایەنگیری کردن؛ پشت گرتن.
**underpinning** (un′dēr-pin´iŋ), ***n.*** (١) بنچینە؛ کۆڵەکە؛ دارو بەردی دیوار ڕاگیرکەر؛ چوارچێوەی ڕاگیرکەر. (٢) پاڵپشت؛ ڕاگیرکەر؛ پشتگیر. (٣) (*pl.*) جلی ژێرەوە (وەك هی ژێر تەنوورە، بۆ ڕاگرتنی بە جوانی، یا هی وەرزشکار بۆ پاراستنی). (٤) (*pl.*) [Colloq.]، هەردوو لاق.
**underplay** (un′dēr-plā´), ***v.t. v.i.*** (١) خۆنواندن لەسەر شانۆ بەبێ بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن. (٢) لەسەر کەمتر یاری کردن یا قومارکردن.
**underplot** (un′dēr-plot´), ***n.*** لقە چیرۆك چیرۆکی ناسەرەکی شانۆنامە یا چیرۆك و داستان
**underprivileged** (un′dēr-priv′ə-lijd), ***adj.*** دەستکورت؛ داماو؛ هەژار؛ بێ دەرامەت.
**the underprivileged,** فەقیرو هەژاران.
**underproduction** (un´dēr-prə-duk′shən), ***n.*** بەرهەم کەمی
**underproof** (un′dēr-prōōf′), ***adj.*** ڕادەی کحول کەمترە لە خواردنەوەی مەستکەری تر
**underprop** (un´dēr-prop′), ***v.t.*** لەژێرەوە شت دانەبەر (بۆ پاڵپشتی)؛ ڕاگرتن.
**underquote** (un′dēr-kwōt´), ***v.t.*** نرخی کەمتر پێ وتن لە نرخی ئاسایی یا لە خەڵکی تر
**underrate** (un′dēr-rāt´), ***v.t.*** = **underestimate.**
**underrun** (un′dēr-run´), ***v.t.*** بە ژێریدا ڕۆیشتن.
***n.*** شتی بە ژێردا ڕۆیشتوو (وەك جۆگە).
**underscore** (un′dēr-skôr´, un′dēr-skōr´), ***v.t. & n.*** **underline.**
**undersea** (un′dēr-sē´), ***adj.*** هی ژێر دەریا؛ بۆ ژێر دەریا کراو؛ لەژێر دەریادا ڕووداو. (هەروەها " **underseas** ").
**undersecretary** (un′dēr-sek′rə-ter´i), ***n.*** جێگری وەزیر؛ وەکیلی وەزارەت؛ یاریدەدەری وەزیر: ***( ~ of State)*** .
**undersell** (un´dēr-sel′), ***v.t.*** (١) بە هەرزانتر فرۆشتن (لە خەڵك)؛ بە کەمتر فرۆشتن ***( He ~s his competitors.)*** . (٢) بە هەرزانتر فرۆشتن لەو پارەیەی تێ ی چووە.
**undersexed** (un′dēr-sekst´), ***adj.*** ئارەزووی جووت بوونی کەمە؛ سارد؛ حەز لە گان نەکەر.
**undershirt** (un′dēr-shûrt´), ***n.*** فانیلەی ژێرەوە.
**undershoot** (un′dēr-shōōt´), ***v.t.*** (١) گوللە تەقاندن بە جۆرێك کە نەگاتە نیشانەکەی یا لەژێریدا بنیشێتەوە؛ مووشەك هاویشتن بە هەمان شێوە. (٢) نیشتنەوەی فڕۆکە پێش فڕۆکەخانە.
**undershot** (un′dēr-shot´), ***adj.*** (١) ددانی پێشەوەی خوارەوە دەرپۆقیو (٢) کاژێری خوارەوە دەرپۆقیو. (٣) بە ئاوی ژێرەوەی دەخولێتەوە (چەرخی ئاو).
**undershrub** (un′dēr-shrub´), ***n.*** بنچك؛ بنچك و گژوگیای ژێر درەخت؛ دەوەن
**underside** (un′dēr-sīd´), ***n.*** دیوی ژێرەوە
**undersign** (un′dēr-sīn´), ***v.t.*** لە دامێنەوە ئیمزاکردن (بەڵگەنامە، نامە)؛ مۆرکردن
**undersigned** (un′dēr-sīnd´), ***adj.*** (١) لە دامێنەوە ئیمزاکراو (٢) لە دامێنەوە ئیمزاکردوو.
**the undersigned,** لە دامێنەوە ئیمزاکەر؛ ئیمزاکەران.
**undersized** (un′dēr-sīzd′), ***adj. Also*** **undersize,** بچووکتر لە ئاسایی؛ بچووك.
**underskirt** (un′dēr-skûrt´), ***n.*** ژێرکراس؛ تەنوورەی ژێرەوە.
**undersoil** (un′dēr-soil´), ***n.*** خاکی ژێر چینی سەرەوە.
**understand** (un´dēr-stand′), ***v.t.*** (١) تێگەیشتن. (٢) سەر لێ دەرکردن؛ ڕێ پێ بردن؛ سەر لێ دەرچوون. (٣) وادانان. (٤) لێکدانەوە. (٥) پێ وابوون؛ وازانین (٦) بیستن؛ ئاگاداربوون؛ هەواڵ پێ گەیشتن.
***v.i.*** (١) تێگەیشتن. (٢) وازانین؛ بیستن؛ بڕوا وابوون: ***( I ~ she is no longer working here.)***
-**understandable *(adj.)*; understandably *(adv.).***
**understanding** (un´dēr-stan′diŋ), ***n.*** (١) تێگەیشتن. (٢) زیرەکی؛ توانای تێگەیشتن؛ مێشك. (٣) شێوەی تێگەیشتن؛ بۆچوون؛ لێکدانەوە: ***( This is my ~ of the matter.)*** (٤) ڕێکەوتن: ***( The two countries have come to an ~ over that issue.)***
***adj.*** (١) تێگەیشتوو؛ تێگەییو؛ بزان؛ زانا. (٢) هاوسۆز؛ بە بەزەیی: ***( He is kind and ~.)*** .
**understate** (un′dēr-stāt´), ***v.t. & v.i.*** بە کەمەوە باس کردن؛ بە کەمترو ناگرنگتر دەربڕین لەوەی کە هەڵدەگرێت؛ لە گرنگی و مەترسی و ڕاستی (مەسەلەیەك) کەمکردنەوە: ***( They exaggerate the enemy's losses and ~ their own.)***
**understatement** (un′dēr-stāt´mənt), ***n.*** بە کەمەوە باس کردن؛ وتەیەکە کە بە کەمترو ناگرنگتر مەسەلەیەك دەردەبڕێت لەوەی کە دەهێنێت
**understood** (un´dēr-stood′), *past tense and past-participle of* **understand.**
***adj.*** (١) لەسەر ڕێکەوتوو. (٢) دەرنەبڕاوە بە ئاشکرا، بەڵام وا دەگەیەنێ و خەڵك وای تێگەیشتووە.
**understrapper** (un′dēr-strap´ēr), ***n.*** = **underling.**
**understudy** (un′dēr-stud´i), ***n.*** (١) جێگری نوێنەر: کەسێکە خۆی ئامادە دەکات بۆ جێگرتنەوەی نوێنەرێکی شانۆ ئەگەر پێویست بکات (٢) بریکار؛ جێگر؛ کەسێکە کە ئیش وکاری کەسێکی تر فێر دەبێت بۆ جێگرتنەوەی ئەگەر پێویست بکات.
***v.t. & v.i.*** (١) جێگرتنەوەی کەسێك بە سەردەمی. (٢) ئیش وکاری کەسێك فێربوون بۆ جێگرتنەوەی لە ئاکاودا بۆ ماوەیەك.
**undersurface** (un′dēr-sûr´fis), ***n.*** دیوی ژێرەوە؛ ژێرەوەی.
**undertake** (un´dēr-tāk′), ***v.t.*** (١) پێ هەڵسان؛ هەڵسان بە کارێك؛ کردن (بەتایبەتی کارێکی گران): ***( to ~ a piece of work, task, etc.)*** (٢) گرتنەئەستۆ؛ گرتنەدەست. (٣) بەڵێن دان؛ پەیمان دان. (٤) [Obs.]، بەرەنگاربوون؛ ڕووبەڕوو وەستان بۆ جەنگ.
***v.i.*** (١) [Archaic] گرتنەئەستۆ؛ گرتنەدەست؛ بەڵێن دان بە کردنی کارێك. (٢) [Colloq.]، ئیش وکاری مردوونێژی کردن؛ مردوو ناشتن.
**undertaker** (un′dēr-tāk´ēr), ***n.*** (١) کارگێڕ؛ کارکەر. (٢) مردوونێژ (بە پیشە)؛ مردووشۆر.
**undertaking** (un′dēr-tāk´iŋ), ***n.*** (١) کار؛ کاری گران؛ ئەرك؛ ئیشێکی قورس؛ پرۆژە (٢) بەڵێن؛ پەیمان. (٣) پیشەی مردوو شۆردن و ناشتن؛ کفن و دفن کردن. (٤) شت گرتنەئەستۆی خۆ؛ شت گرتنەدەست.
**undertenant** (un′dēr-ten´ənt), ***n.*** = **subtenant.**
**under-the-counter,** بە دزییەوە فرۆشراو یا کڕاو (بەتایبەتی شتی دەست نەکەوتوو)؛ قاچاخ: ***( ~ sale of drugs)*** .

(ووشەی دوایش ببینە).
**under-the-table,** لە ژێرەوە دراو یا وەرگیراو (کرێ)؛ بە دزییەوە
فرۆشراو یا کڕاو: *( He was paid ~ for the work he did.)* .
(ووشەی پێشوو ببینە).
**undertone** (un′dēr-tōn´), *n.* (١) دەنگی نزم.
(٢) شتێکە دەنگی نزمی پێ کرابێت.
(٣) ڕەنگی کاڵ (بەتایبەتی لەگەڵ چەند ڕەنگێکی تردا).
(٤) نیشانەی شتێك یا بارودۆخێکی شاراوە:
*( There was an ~ of horror.)*
**undertook** (un´dēr-took′), *past tense of* **undertake.**
**undertow** (un′dēr-tō´), *n.* تەووژمی ژێر ئاو؛ ژێر تەووژم:
تەووژمێکی قایمە لە ژێرو بە پێچەوانەی تەووژمی سەرەوەی ئاوەوە.
(ئەم تەووژمە بەرەو دەریایە دژی شەپۆل ئاو کە بەرەو ووشکانی دەشکێتەوە).
(هەروەها " **undercurrent** " ببینە).
**undervalue** (un´dēr-val′ū), *v.t.* (١) نرخ بە کەم دانان؛
بە کەمتر هەڵسەنگاندن یا قەبلاندن (لە نرخی ڕاستی)؛ کەمتر بایەخ پێدان.
(٢) بە سووك تەماشاکردن؛ نرخ نەزانین؛ ڕێز نەگرتن؛ بە کەم دانان.
(٣) نرخ شکاندن؛ نرخ کەمکردنەوە.
**-undervaluation** *(n.).*
**undervest** (un′dēr-vest´), *n.* [British]. = **undershirt.**
**underwater** (un′dēr-wô′tēr), *adj.* (١) ژێرئاو؛ هی ژێرئاو.
(٢) لە ژێرئاودا بەکارهێنراو.
**under way,** (١) دەستی پێ کراوە؛ کەوتووەتە گەڕ؛ لەگەڕدایە
(٢) بەردەوامە (پرۆژە، کار).
**underwear** (un′dēr-wâr´), *n.* دەرپێ؛ جلی ژێرەوە.
**underweight** (un′dēr-wāt´), *adj.* سووك
*n.* سووکی.
**underwent** (un´dēr-went′), *past tense of* **undergo.**
**underwing** (un′dēr-wiŋ´), *n.* (١) باڵی بچووکی دواوەی جانەوەری
وەك پەپوولە (٢) جانەوەرێکی وەك پەپوولەیە باڵی بچووکی ڕەنگاوڕەنگی
لە دواوە هەیە.
**underwood** (un′dēr-wood´), *n.* = **underbrush.**
**underworld** (un′dēr-wŭrld´), *n.* (١) [Archaic] زەمین؛
سەرزەمین (٢) ژێرزەمین (٣) دۆزەخ؛ جیهانی مردووان کە لە ژێر زەمیندایە
(ئەفسانەی یۆنانی و ڕۆمانی). (٤) دیوی ئەودیوی زەمین.
(٥) (ا) بەشی تاوانکاری و خراپەکاری و داوێن پیسی کۆمەڵ
(ب) تاوانکاران و خراپەکاران؛ ئەوانەی پیشەیان تاوانکاری و خراپەیە.
**underwrite** (un′dēr-rīt´), *v.t.* (١) لە ژێرەوە نووسین (بەتایبەتی
لەژێر نووسراوێکی ترەوە لە ڕووی پەسەندکردنەوە).
(٢) لە ئامێنەوە ئیمزاکردن.
(٣) بەڵێن دان بە پارە دان (بە ئیمزاکردنی بەڵگەنامەیەك).
(٤) دەستەبەری کردنی بەش و قەواڵەی دارایی کڕین بە نرخێکی تایبەتی
(پارەبازی) (٥) پەسەندکردن؛ مۆرکردن؛ ئیمزاکردن.
(٦) بەڵێن دان بە پشتگیری کردنی پرۆژەیەك بە پارە. (٧) بیمەکردن.
*v.i.* بیمەکردن (کارگێڕی کۆمپانیای بیمە).
**underwriter** (un′dēr-rīt´ēr), *n.* (١) بیمەکەر کارگێڕی کۆمپانیای
بیمە یا کۆمپانیاکە خۆی. (٢) دەستەبەری قەواڵەی دارایی و بەشی کۆمپانیای
هاوبەشی (پارەبازی).
**undeservedly** (un′di-zŭr′vid-li), *adv.* بە ناڕەوا؛ بە ناڕەوایانە.
**undesigning** (un′di-zīn´iŋ), *adj.* ڕاست؛ پاك؛ بێ پێچ و پەنا؛
بێ ئایرونۆین.
**undesirable** (un´di-zīr′ə-b'l), *adj.* ناپەسەند؛ بێ برەو؛ نالەبار:
ناخۆش.
*n.* کەسێکی ناپەسەند یا لەنالەبار
**-undesirability** *(n.).*

**undetermined** (un´di-tŭr′mind), *adj.* (١) بڕیار نەدراو؛
نەبڕاوەتەوە (٢) نەزانراو (ژمارە یا ڕادەی شتێك):
*( an - number of dead and wounded)*
**undid** (un-did′), *past tense of* **undo.**
**undies** (un′diz), *n.pl.* [Colloq.], دەرپێی ژن و منداڵ؛
جلی ژێرەوەی ژن و منداڵ.
**undignified** (un-dig′ə-fīd´), *adj.* بێ شکۆ؛ سووك؛ ناشرین.
**undiminished** (un´də-min′isht), *adj.* کەم نەبووەتەوە.
**undirected** (un´də-rek′tid, un´dī-rek′tid), *adj.* (١) ڕابەری
نەکراو؛ بێ ڕابەر. (٢) بێ ناونیشان (نامە).
**undisciplined** (un-dis′ə-plind´), *adj.* لاسار؛ دابین نەکراو؛
بەرەڵا.
**undisguised** (un´dis-gīzd′), *adj.* لەڕوو؛ ئاشکرا؛ هەڵمانراو؛
نەشاراوە.
**undisposed** (un´dis-pōzd′), *adj.* (١) ( **~ of** )، نەبڕاوەتەوە؛
بڕیار لەسەر نەدراو. (٢) بێ مەیل؛ بێ ئارەزوو؛ حەز پێ نەکەر
**undo** (un-dōō′), *v.t.* (١) کردنەوە (قۆپچە، گرێ، قەیتان)؛ ترازاندن؛
شل کردنەوە. (٢) کردنەوە (دەرگا، پریاسکە). (٣) هەڵوەشاندنەوە؛ سڕینەوە؛
پووچ کردنەوە. (٤) بە ئاخدا بردن؛ نشوستی پێ هێنان؛ ڕووخاندن؛ نەهێشتن؛
تێکدان؛ وێران کردن (٥) [Obs.]، ڕوونکردنەوە؛ لێکدانەوە
**undoing** (un-dōō′iŋ), *n.* (١) هەڵوەشانەوە؛ پووچ کردنەوە؛
پووچ بوونەوە؛ سڕینەوە (٢) (ا) بەئاخداچوون؛ ڕووخاندن؛ وێران کردن؛
نشوستی پێ هێنان؛ تێکدان. (ب) بەئاخداچوون؛ ڕووخان؛ وێران بوون؛
نشوستی هێنان؛ تێکچوون. (٣) هۆی بە ئاخدا چوون، وێران بوون، تێکچوون،
یا ڕووخان.
**undone** (un-dun′), *past participle of* **undo.**
*adj.* (١) تێکدراو؛ وێران کراو؛ بەئاخداچوو؛ وێران؛ ڕووخاو.
(٢) هەڵوەشاو؛ کراوە؛ ترازاو
**undone** (un-dun′), *adj.* تەواو نەکراو؛ تەواو نەبوو
**undoubted** (un-dout′id), *adj.* ڕاستەقینە؛ گومانی تێدا نییە؛
ناکۆکی لەسەر نییە *( He is the ~ leader of his people.)*
**undoubtedly** (un-dout′id-li), *adv.* بێ گومان.
**undraw** (un-drô′), *v.t. & v.i.* هەڵدانەوە (پەردە)؛ کردنەوە:
*( U~ the curtains.)*
**undress** (un-dres′), *v.t.* (١) ڕووتکردنەوە؛ جل لەبەر داکەندن.
(٢) هەڵماڵین؛ ڕووکەش لێ لابردن. (٣) سارغی لە برین کردنەوە.
*v.i.* خۆ ڕووتکردنەوە؛ جل لەبەر خۆ داکەندن.
*n.* (١) کراسی دەڵب. (٢) جل وبەرگی ئاسایی. (٣) ڕووتی؛ ڕووتێتی.
**undressed** (un-drest′), *adj.* (١) (ا) ڕووت؛ ڕووت وقووت.
(ب) نیمچە ڕووت. (٢) خۆش نەکراو (پێستە): *( ~ hides)* .
(٣) نەپێچراو (برین): *( an ~ wound)*
**undue** (un-dōō′, un-dū′), *adj.* (١) کاتی دانەوەی نییە یا نەهاتووە
(قەرز). (٢) نابەجێ؛ نێجگار زۆر؛ لە ڕادە بەدەر:
*( paying ~ attention to someone; ~ worry, anxiety, etc.)*
(٣) ناڕەوا؛ نایاسایی *( ~ use of power)* .
**undulant** (un′joo-lənt, un′doo-lənt), *adj.* شەپۆلی؛
شەپۆلدەرەوە.
**undulant fever,** تای ماڵتە؛ تای شەپۆلی: نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی
نۆرە تاو سپڵ ئاوسان و ئارەق کردنەوەو ئازاری جومگەو ماسولکە لە شیرەوە
دادەکەوێت.
(پێشی دەووترێ: " Malta ( or Mediterranean ) fever ").
**undulate** (un′joo-lāt´, un′doo-lāt´), *v.t.* وەك شەپۆل لێکردن؛
بەرزو نزم کردنەوە.
*v.i.* (١) شەپۆلدان؛ بەرزو نزم بوونەوە؛ پێچاوپێچ کردن. (٢) لە شەپۆل چوون
*adj.* شەپۆلی؛ شەپۆلدەرەوە.

**undulation** (un´joo-lā′shən), *n.* (١) شەپۆلدانەوە؛
بزوانی پێچاوپێچی (وەك مار) (٢) قەراغی شەپۆلی یا بەرزو نزم (وەك هی
هەندێ گەڵا) (٣) پل دان؛ دڵ لێدان.
(٤) شەپۆلدانەوەی ڕووناکی و دەنگ (فیزیا)
**undulatory** (un′joo-lə-tôr´i, un′doo-lə-tô´ri), *adj.* (١)-
شەپۆلی؛ شەپۆل ئاسایی. (٢) شەپۆلدەرەوە
**unduly** (un-dōō′li, un-dū′li), *adv.* (١) لە ڕادە بەدەر؛ نابەجێ؛
تێجگار زۆر ***( You are ~ harsh with her.)***.
(٢) بە نارەوا؛ بە ناپاسایی
**undutiful** (un-dōō′ti-fəl, un-dū′ti-fəl), *adj.* بێ گوێ؛
هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆ نەکەر؛ سەرپێچ؛ یاخی.
**undying** (un-dī′iŋ), *adj.* نەمر؛ هەتا هەتا؛ هەمیشەیی: ***( ~ love)***.
**unearned** (un-ûrnd′), *adj.* (١) بە هەوڵ و کۆشش دەست نەکەوتوو؛
بەبێ ڕەنج دەست کەوتوو: ***( ~ income)***. (٢) ناشایستە.
**unearned increment,** زیادەی بە هەوڵ و کۆشش دەست نەکەوتوو:
بەرزبوونەوەی نرخی خانو و زەوی‌وزار بێ ڕەنج دان و پارە تێدا خەرج
کردنی خاوەنەکەی بەڵکو بەهۆی برەو سەندنی ناوچەکەوە
**unearth** (un-ûrth′), *v.t.* (١) لە ژێر خاك دەرهێنان.
(٢) دۆزینەوە؛ خستنەڕوو؛ دەرخستن؛ هەڵماڵین.
***( The lawyer ~ed some new evidence.)***
**unearthly** (un-ûrth′li), *adj.* (١) لە سرووشت بەدەر؛ نازەمینی
(٢) ترسناك؛ سەیرو ناسرووشتی؛ تۆقێنەر: ***( an ~ scream)***.
(٣) بێ مانا؛ نائاسایی: ***( She woke me up at an ~ hour.)***.
**-unearthliness** ***(n.)***.
**uneasy** (un-ē′zi), *adj.* (١) بێ ئاسوودە؛ نائاسوودە؛ بێ ئارام؛
دڵەڕاوکێ‌بەتی ***( The farmers were ~ until the crop was in.)***.
(٢) شلۆق؛ ناسك: ***(an ~ calm, peace, etc.)***
(٣) نارەحەت ***(He is ~ with strangers.)***.
**-uneasily** ***(adv.)***; **uneasiness** ***(n.)***.
**uneducated** (un-ej′oo-kā´tid), *adj.* نەخوێندەوار؛ چاونەکراوە
**unemployable** (un´im-ploi′ə-b'l), *adj.* ئیشی نادرێتێ؛
ئیشی پێ ناکرێ.
***n.*** کەسێکی ئیشی پێ نەکراو یا نەدراو.
**unemployed** (un´im-ploid′), *adj.* (١) بێ ئیش؛ بێکار؛ بەتاڵ
***( ~ workers)***
(٢) بەکارنەهێنراو (کەرەسە، ئامێر)؛ لە ئیش خراو
***n.*** کەسێکی بێ ئیش
**the unemployed,** بێکاران: خەڵکی بێ ئیش.
**unemployment** (un´im-ploi′mənt), *n.* بێ ئیشی: بێکاری؛
بەتاڵی
**unemployment compensation,** مووچەی کرێکارو مووچە-
خۆری بێ ئیش: ئەو پارەیەیە کە هەر دوو هەفتە جارێك وە بۆ ماوەیەکی
تایبەتی میری دەیدات بەو مووچەخۆرو کرێکارانەی ئیشیان نەماوە.
**unending** (un-en′diŋ), *adj.* بێ پایان؛ دوایی نەهاتوو.
**unenlightened** (un´in-līt′'nd), *adj.* چاونەکراوە؛ نەزان؛
مێشك نەکراوە
**unenthusiastic** (un´in-thoo´zi-as′tik), *adj.* دڵ سارد؛ سارد؛
حەز پێ نەکەر
**unequal** (un-ē′kwəl), *adj.* (١) ناهاوتا؛ نابەرامبەر؛ لاسەنگ؛
لارەسەنگ (٢) نارێك (٣) نایەکسان؛ ناهاوشێوە؛ ناچوونیەك.
(٤) ( ~ to) نەشیاو؛ لێ نەهاتوو؛ دەرەقەت نەهاتوو:
***( She proved ~ to the job.)***
(٥) نارەوا؛ نایەکسان؛ ناهەق
***n.*** کەسێکی پلە خوارتر یا نزمتر.
**-unequally** ***(adv.)***.

**unequaled, unequalled** (un-ē′kwəld), *adj.* بێ هاوتا؛
بێ وێنە؛ نایاب.
**unequivocal** (un´i-kwiv′ə-k'l), *adj.* ڕێك‌وڕەوان؛ ڕاست و ڕەوان؛
یەك لا؛ دیار؛ ڕوون؛ بێ پێچ و پەنا: ***(an ~ answer)***.
-unequivocally ***(adv.)***.
**unerring** (un-ûr′iŋ, un-er′iŋ), *adj.* (١) بێ هەڵە؛ هەڵەنەکەر
(٢) ڕاست؛ تەواو؛ وورد
**unessential** (un´i-sen′shəl), *adj.* ناپێویست.
***n.*** شتێکی ناپێویست.
**uneven** (un-ē′vən), *adj.* (١) نارێك؛ چاڵ‌وچۆڵاوی؛ بەرزونزماوی؛
ناتەخت؛ ناهەموار؛ ناساف؛ زبر. (٢) ناهاوڕێك؛ نابەرامبەر؛ چەوت.
(٣) ناهاوتا؛ لاسەنگ؛ لارەسەنگ
(٤) جیا؛ هەمووی وەك یەك باش نی‌یە؛ لاسەنگ:
***( an ~ performance; ~ work)***
(٥) [Rare]، نایەکسان؛ نارەوا.
(٦) تاك (ژمارە) (وەك: ٣، ٧، ١١ ... هتد).
-unevenly ***(adv.)***; **unevenness** ***(n.)***.
**uneventful** (un´i-vent′fəl), *adj.* هیچی گرنگ تێدا ڕوونەداو:
***( an ~ day, week, trip, etc.)***
-uneventfully ***(adv.)***; **uneventfulness** ***(n.)***.
**unexampled** (un´ig-zam′p'ld), *adj.* بێ وێنە؛ وێنەی لەوەو
پێش نەبینراوە.
**unexceptionable** (un´ik-sep′shən-ə-b'l), *adj.* بێ گەرد؛
هیچ ڕەخنە هەڵناگرێت.
**unexceptional** (un´ik-sep′shən-'l), *adj.* (١) ئاسایی؛
نائاسایی نی‌یە (٢) بەبێ جیاوازی.
**unexpected** (un´ik-spek′tid), *adj.* کوتوپڕ؛ چاوەڕوان نەکراو.
**unexpectedly** (un´ik-spek′tid-li), *adv.* لەناکاو؛ کوتوپڕ.
**unexpressive** (un´ik-spres′iv), *adj.* (١) توانای هەست و
بیروباوەڕ دەربڕینی نی‌یە: ***( a bland and ~ person)***.
(٢) [Obs.]، دەرنابڕدرێت؛ ناتوانرێت دەرببڕدرێت.
**unfailing** (un-fāl′iŋ), *adj.* (١) پشت پێ بەستراو؛ هەمیشەیی:
***( an ~ friend; an ~ source of electric power)***
(٢) بێ پایان؛ دوایی نەهاتوو؛ لە بن نەهاتوو: ***( ~ resources)***
(٣) هەڵەنەکەر؛ هەمیشە ڕاست: ***( an ~ guide, indication, etc.)***
**unfair** (un-fâr′), *adj.* (١) نارەوا؛ ناهەموار؛ نایەکسان: ***( an ~ law)***.
(٢) چەوت؛ ساختە؛ ناپاك: ***( ~ means, business practices, etc.)***.
-unfairly ***(adv.)***; **unfairness** ***(n.)***.
**unfaithful** (un-fāth′fəl), *adj.* (١) نادڵسۆز؛ ناپاك.
(٢) ناتەواو؛ نادەقاودەق؛ ناڕاست.
(٣) داوێن پیس؛ ناپاك لەگەڵ ژن یا مێردی خۆدا.
(٤) [Obs.]، بێ ئاین؛ خوانەناس؛ کافر.
-unfaithfully ***(adv.)***; **unfaithfulness** ***(n.)***.
**unfamiliar** (un´fə-mil′yēr), *adj.* (١) نەبیستراو؛ نەبینراو؛
نەزانراو؛ نەناسراو؛ تازە. (٢) نەشارەزا؛ نەزان: ***( He is ~ with tools.)***
-unfamiliarity ***(n.)***.
**unfasten** (un-fas′'n, un-fäs′'n), *v.t.* کردنەوە؛ ترازاندن؛
شل کردنەوە.
*v.i.* کرانەوە؛ ترازان؛ شل بوونەوە
**unfathered** (un-fä′thērd), *adj.* (١) (ا) بێ باوك (ب) زۆڵ؛ ناکەس؛
ناکەس بەچە. (٢) دانەرەکەی نەزانراوە؛ سەرچاوەکەی نەزانراوە:
***( ~ tales)***
**unfathomable** (un-fath′əm-ə-b'l), *adj.* (١) بێ بن؛ زۆر قووڵ؛
قووڵی‌یەکەی ناپێورێت. (٢) سەری لێ دەرناکرێت؛ ناتوانیت لێی تێ بگەیت.
**unfavorable** (un-fā′vēr-ə-b'l), *adj.* (١) نەهات؛ نالەبار:

*(~ weather)*
(٢) دژ؛ ناحەز؛ خراپ: *(an ~ opinion, response, etc.)*.
(٣) ناپەسەند؛ خراپ؛ بە دل نەبوو.
**unfeeling** (un-fēl′iŋ), *adj.* (١) بێ هەست؛ سارد.
(٢) دلڕەق؛ بێ بەزەیی.
**-unfeelingly** *(adv.)*.
**unfeigned** (un-fānd′), *adj.* ڕاستەقینە؛ بێ ڕووکەش؛ بێ ڕواڵەت
**unfetter** (un-fet′ēr), *v.t.* لە کۆت و زنجیر ڕزگارکردن؛ ئازادکردن.
**unfinished** (un-fin′isht), *adj.* (١) ناتەواو؛ تەواو نەکراو؛
تەواو نەبوو؛ نیوەناچڵ: *(~ business)*.
(٢) (أ) بۆیە نەکراو؛ ساف و لووس نەکراو.
(ب) ناڕێک‌وپێک؛ ناڕێك؛ زۆر باش نییە (بەرهەمی هونەری).
**unfit** (un-fit′), *adj.* (١) بەکار نایەت؛ نەگونجاو؛ بەکەڵك نایەت؛
باش نییە. (٢) نەشیاو؛ لێ نەهاتوو: *(She is ~ for the job.)*.
(٣) تەندرووستی باش نییە
**unfix** (un-fiks′), *v.t.* (١) کردنەوە؛ لێك ترازاندن؛ شل کردنەوە.
(٢) شلەژاندن؛ شڵەقاندن؛ تێکدان.
**unfledged** (un-flejd′), *adj.* (١) پەڕو باڵ دەرنەکردوو؛ زەڕنەقووتە؛
باڵەفڕێ نەبوو (٢) کاڵ‌وکرچ؛ نەشارەزا؛ فەریك؛ نەوکار؛ تازە:
*(an ~ writer)*
**unflattering** (un-flat′ēr′iŋ), *adj.* ناحەز؛ ناشرین؛ خراپ؛ دژ
*(an ~ comment)*
**unflinching** (un-flin′chiŋ), *adj.* چاونەترس؛ دل نەلەرزیو؛
بێباك
**unfold** (un-fōld′), *v.t.* (١) قەدکردنەوە؛ کردنەوە (شتی قەدکراو)؛
ڕاخستن (٢) کردنەوە (شتی پێچراوە)؛ هەڵماڵین.
(٣) بەرە بەرە دەرخستن یا ڕوونکردنەوە؛ پیشاندان بە نووسین یا بە دەم.
*v.i.* (١) کرانەوە. (٢) بەرە بەرە لێ تێگەیشتن؛ هاتنە پێش چاو؛ ڕوون بوونەوە؛
دەرکەوتن.
**unforeseen** (un′fôr-sēn′, un′fōr-sēn′), *adj.* چاوەڕوان نەکراو
(ڕووداو)؛ لەپڕ ڕووداو
**unforgetable** (un′fôr-get′ə-b'l), *adj.* هەرگیز لە بیر ناچێت.
**unforgiving** (un′fôr-giv′iŋ), *adj.* نەبەخشیو؛ لێ خۆش نەبوو؛
نەبورد‌وو
**unformed** (un-fôrmd′), *adj.* (١) بێ شێوە.
(٢) ڕێك نەخراو؛ پێك نەهاتوو. (٣) پێ نەگەیشتوو؛ پەرەنەسەندوو.
(٤) درووست نەکراو؛ درووست نەبوو.
**unfortunate** (un-fôr′chə-nit), *adj.* (١) بەدبەخت؛ بێ بەخت؛
نەگبەت؛ کوڵۆل (٢) جێی داخە؛ ناپەسەند *(an ~ remark)*.
(٣) نەهات؛ بەیووم.
*n.* کەسێکی بێ بەخت، نەگبەت، یا بەدبەخت.
**unfortunately** (un-fôr′chə-nit-li), *adv.* بەداخەوە؛ داخەکەم؛
داخی گرانم
**unfounded** (un-foun′did), *adj.* (١) درۆ؛ بێ بنچینە:
*(~ allegations)*
(٢) درووست نەکراو؛ دانەمەزراو.
**unfrequented** (un-frē′kwən′tid), *adj.* کەس بۆی ناچێت؛
نامشۆ نەکراو؛ چۆڵ.
**unfriended** (un-fren′did), *adj.* بێ دۆست؛ بێ برادەر؛ بێکەس.
**unfriendliness** (un-frend′li-nis), *n.* ڕووناخۆشی؛ ووشکی؛
ساردی؛ ڕووترشی
**unfriendly** (un-frend′li), *adj.* (١) ڕووناخۆش؛ ووشك؛ سارد؛
ڕووترش. (٢) ناحەز؛ دوژمنانە: *(an ~ act)*
(٣) نەشیاو؛ نەگونجاو:
*(an ~ environment, place, atmosphere, etc.)*

**unfrock** (un-fork′), *v.t.* (١) لێ خستنی قەشە؛ دەسەلات لە قەشە
سەندنەوە (بە لێسەندنەوەی جبەکەی). (٢) لە ئیش دەرکردن؛ لێ خستن.
**unfruitful** (un-fōōt′fəl), *adj.* (١) بێ بەر؛ نەزۆك.
(٢) بێ سوود؛ بێ کەڵك.
**-unfruitfully** *(adv.)*; **unfruitfulness** *(n.)*.
**unfurl** (un-fũrl′), *v.t.* کردنەوە (ئاڵا، بایەوان).
*v.i.* کرانەوە
**unfurnished** (un-fũr′nisht), *adj.* بێ کەل‌وپەلی ناومال؛
بێ کەرەسەی ناومال: *(an ~ house, apartment, etc)*
**ungainly** (un-gān′li), *adj.* (١) ناشرین (بەڕێوە ڕۆیشتن)؛
بێ لەنجەولار؛ ناشۆخ. (٢) قەبە؛ ناقۆڵا؛ بە ئاسانی بەکارناهێنرێت لەبەر قەبەیی.
**-ungainliness** *(n.)*.
**ungenerous** (un-jen′ēr-əs), *adj.* (١) پوولەکی؛ ڕەزیل؛ پیسکە؛
گیر. (٢) توندوتیژ؛ توند؛ ڕەق؛ بێ بەزەیی: *(~ remarks)*.
**ungird** (un-gũrd′), *v.t.* (١) پشتێن یا کەمەربەند کردنەوە؛
شل کردنەوە. (٢) لابردن بە کردنەوەی پشتێن یا کەمەربەند.
**ungirt** (un-gũrt′), *adj.* (١) بێ پشتێن یا کەمەربەند؛ پشتێن یا
کەمەربەند کراوە. (٢) شل کراوە؛ شل؛ توند نەکراو؛ نەچەڕێنراو.
**unglued** (un-glōōd′), *adj.* لێك جیابووەوە (شتی بە جەوی لێکدراو).
**come unglued**, [Slang], تێکچوون؛ زۆر پەست و توورەبوون؛ شێوان.
**ungodly** (un-god′li), *adj.* (١) بێ ئاین؛ خوانەناس؛ کافر.
(٢) بەدکار؛ بەدکردە؛ بەد؛ پیاوخراپ؛ گوناهکار.
(٣) [Colloq.]، زۆر خراپ: *(He woke us up at an ~ hour.)*.
**-ungodliness** *(n.)*.
**ungovernable** (un-guv′ērn-ə-b'l), *adj.* دابین نەکراو؛ یاخی؛
لاسار؛ سەرکێش.
**ungraceful** (un-grās′fəl), *adj.* ناشۆخ؛ بێ لەنجەولار؛
ناشرین (بەڕێوە ڕۆیشتن یا وەستان).
**ungracious** (un-grā′shəs), *adj.* (١) ڕووترش؛ ڕووناخۆش؛
بێ نەزاکەت؛ ناشرین (ڕەفتار): *(~ behavior)*.
(٢) ناخۆش؛ پیس؛ ناپەسەند. *(an ~ task)*.
**-ungraciously** *(adv.)*; **ungraciousness** *(n.)*.
**ungrammatical** (un′grə-mat′i-k'l), *adj.* بەپێی ڕێزمان نییە؛
هەڵەی ڕێزمانی تێدایە
**ungrateful** (un-grāt′fəl), *adj.* (١) بەدنمەك؛ سپڵە؛ نمەك کوێر؛
بێ سفەت. (٢) ناخۆش (کار، ئەرك).
**-ungratefully** *(adv.)*; **ungratefulness** *(n.)*.
**ungual** (uŋ′gwəl), *adj.* نینۆکی؛ چڕنووکی؛ سمدار؛ چڕنووکدار.
**unguarded** (un-gärd′id), *adj.* (١) نەپارێزراو؛ بەرەڵا
(٢) بێباك؛ ئاگادار؛ ناووریا.
**unguent** (uŋ′gwənt), *n.* مەڵحەم.
**unguiculate** (uŋ-gwik′yoo-lāt′), *adj.* چڕنووکدار؛ نینۆکدار
*n.* گیانداری چڕنووکدار یا نینۆکدار.
**unguis** (uŋ′gwis), *n.* چڕنووك؛ نینۆك
**ungula** (uŋ′gyoo-lə), *n.* (١) سم. (٢) چڕنووك؛ نینۆك.
(٣) بنی پەڕەی گوڵ (کە تیژە وەك نینۆك).
(٤) قووچەکی سەر لێ بڕاو بە خواری.
**-ungular** *(adj.)*.
**ungulate** (uŋ′gyoo-lit, uŋ′gyoo-lāt′), *adj.* (١) سمدار؛
تایبەتی بە گیانداری سمدار. (٢) لە سم دەچێت.
*n.* گیانداری سمدار.
**unhallow** (un-hal′ō), *v.t.* گڵاوکردن؛ پیس کردن.
**unhallowed** (un-hal′ōd), *adj.* (١) گڵاو؛ پیس؛ ناپیرۆز.
(٢) نائاینی؛ کافرانە. (٣) بەد؛ ناپەسەند (کردار): *(~ practices)*
(٤) ناشرین (ڕەووشت)؛ پیس (ڕەفتار)؛ بێ ناموس؛ سووك

**unhand** (un-hand′), *v.t.* دەست لێ بەردان؛ بەردان؛ بەرەڵاکردن.
**unhandsome** (un-han′səm), *adj.* (١) ناشرین؛ نێسک قورس.
(٢) ناشرین (ڕەووشت، کردەوە)؛ بێ نەزاکەت.
**unhandy** (un-hand′i), *adj.* (١) ناقۆلا؛ بە ئاسانی بەکارناهێنرێت؛
قەبە. (٢) ناکارامە؛ دەستەپاچە.
**unhappiness** (un-hap′i-nis), *n.* (١) خەمباری؛ دڵتەنگی؛ پەستی؛
ناخۆشی (٢) بەدبەختی؛ کوڵۆڵی؛ بێ بەختی؛ نەگبەتی.
**unhappy** (un-hap′i), *adj.* (١) بەدبەخت؛ نەگبەت؛ ناخۆش؛
نیشانەی بێ بەختییە: *( an ~ incident)*
(٢) خەمبار؛ دڵتەنگ؛ پەست؛ کەساس؛ دڵ پەست.
(٣) نەشیاو؛ نەگونجاو؛ نابەجێ؛ کەرانە: *( an ~ choice of words)*.
(٤) نەهات؛ بەیووم. *(an ~ omen)*
(٥) [Obs.]. بەد؛ ناپەسەند؛ خراپ؛ پیس.
**-unhappily** *(adv.)*.
**unharness** (un-här′nis), *n.* (١) زین لێکردنەوە یا داگرتن.
(٢) قەڵغان لێکردنەوە یا داکەندن. (٣) بەرەڵاکردن (هەست، ووزە)؛ بەر بۆ بەردان.
**unhealthy** (un-hel′thi), *adj.* (١) نەخۆش؛ ناساغ؛ ناتەندرووست.
(٢) نیشانەی نەخۆشییە
(٣) ناسار؛ ناسازگار؛ بۆ تەندرووستی خراپ؛ نەخۆشخەر:
*( ~ foods, water, air, etc)*
(٤) خراپ (بۆ ڕەووشت)؛ پیس؛ خوو و ڕەووشت خراپکەر.
(٥) ترسناک؛ مەترسی لێ دەکرێت.
**-unhealthily** *(adv.)*; **unhealthiness** *(n.)*.
**unheard** (un-hûrd′), *adj.* (١) نەبیستراو *( The cry went ~ .)*.
(٢) گوێ لێ نەگیراو؛ گوێ پێ نەدراو
(٣) لەوەوپێش نەبیستراو؛ تازە؛ سەیر.
**unheard-of** (un-hûrd′uv′, un-hûrd′ov′), *adj.* لەوەوپێش
نەبیستراو؛ بێ وێنە؛ تازە
**unhinge** (un-hinj′), *v.t.* (١) لە گرێژەنە بردن؛ لە ئەنجامە کردنەوە
(دەرگا) (٢) ئەنجامە لێکردنەوە. (٣) ترازاندن؛ لێک ترازاندن.
(٤) شێواندن؛ سەر لێ شێواندن؛ سەر لێ تێکدان؛ تێکدان.
**unhitch** (un-hich′), *v.t.* ترازاندن؛ لێککردنەوە:
*( to ~ a locomotive from a train)*
**unholy** (un-hō′li), *adj.* (١) گڵاو؛ پیس؛ ناپیرۆز (٢) بەد؛ ناپەسەند؛
بەدخوا؛ بەدکردە (٣) [Colloq.]، خراپ؛ ترسناک؛ تۆقێنەر
**-unholily** *(adv.)*; **unholiness** *(n.)*.
**unhook** (un-hook′), *v.t.* (١) لە قولاپ کردنەوە؛ قولاپ لێکردنەوە.
(٢) لێک ترازاندن؛ لێک جیاکردنەوە؛ لێککردنەوە.
**unhoped-for** (un-hōpt′fôr′), *adj.* چاوەڕوان نەکراو؛
بەتەما نەبوو؛ بە هیوا نەبوو.
**unhorse** (un-hôrs′), *v.t.* (١) لە ئەسپ فڕێدانە خوارەوە؛ گلان؛
خستن (سوار) (٢) هەڵگەڕاندنەوە؛ تێکدان؛ شێواندن.
(٣) ئەسپ لێسەندن
**unhuman** (un-hū′mən), *adj.* (١) [Rare] ، **inhuman** .
(٢) لە توانای مرۆڤ بەدەر؛ لە سەروو مرۆڤەوە.
**unhurried** (un-hûr′id), *adj.* لەسەرخۆ؛ بێ پەلە:
*( an ~ day, decision, etc.)*
**-unhurriedly** *(adv.)*.
**uni-** (ū′nə, ū′ni), پێشگرێکە بەمانای: یەک؛ تاک: *( unicellular)* .
**uniaxial** (ū′ni-ak′si-əl), *adj.* یەک تەوەرە؛ یەک دۆخ.
**unicameral** (ū′ni-kam′ēr-əl), *adj.* یەک ئەنجوومەنی یاسایی
هەیە؛ یەک ئەنجوومەنی پەرلەمانی هەیە.
**unicellular** (ū′ni-sel′yoo-lẽr), *adj.* یەک شانەیی؛ یەک خانەیی
*( ~ organisms)*
**unicolor** (ū′ni-kul′ẽr), *adj.* یەک ڕەنگی؛ یەک ڕەنگ.

**unicorn** (ū′nə-kôrn′), *n.* (١) یەکشاخ: گیانەوەرێکی ئەفسانەیییە
لەشی ئەسپ و کلکی شێری هەیە و شاخێك لە ناوچەوانیدایە.
(٢) [U-]، ناوی کۆئەستێرەیەکە.
**unicostate** (ū′ni-kos′tāt, ū′ni-kôs′tāt), *adj.* یەک دەماری
(گەڵا).
**unicycle** (ū′ni-sī′k'l), *n.* پاسکیلی یەک چەرخە؛ یەک پێچکە؛
یەکشاخ.
**unidirectional** (ū′ni-di-rek′shən-'l, ū′ni-dī-rek′shən-'l)
, *adj.* یەک سەری؛ یەک ڕێبازی؛ بە یەک لادا چوو.
**unification** (ū′nə-fi-kā′shən), *n.* یەکگرتن؛ یەکخستن؛
کردنە یەک؛ بوون بە یەک.
**unifilar** (ū′ni-fī′lẽr), *adj.* یەک تەل؛ یەک تاڵ؛ یەک سیم.
**uniflorous** (ū′ni-flôr′əs, ū′ni-flō′rəs), *adj.* یەک گوڵ؛
تاک گوڵی.
**unifoliate** (ū′ni-fō′li-it, ū′ni-fō′li-āt′), *adj.* (١) یەک گەڵا؛
تاک گەڵایی. (٢) **unifoliolate** .
**unifoliolate** (ū′ni-fō′li-ə-lāt′), *adj.* یەک گەڵا چکۆلەیی (وەك
گەڵای پرتەقاڵ).
**uniform** (ū′nə-fôrm′), *adj.* (١) نەگۆڕاو؛ ڕێك‌وپێك؛ یەک تەوا:
*( a ~ temperature, gait, etc.)*
(٢) چوون یەک؛ یەک وێنە؛ هاوشێوە؛ یەکسان. (٣) گشتی؛ سەرانسەری.
*n.* بەرگی ڕەسمی (وەك هی پۆلیس و سەرباز... هتد)
*v.t.* (١) بەرگی ڕەسمی کردنەبەر. (٢) هاوشێوەکردن؛ وەك یەك لێکردن
**uniformed** (ū′nə-fôrmd′), *adj.* بەرگی ڕەسمی لەبەر؛
جلی ڕەسمی لەبەرکردوو.
**uniformity** (ū′nə-fôr′mə-ti), *n.* (١) نەگۆڕان؛ وەك خۆ مانەوە؛
ڕێك‌وپێکی؛ یەک نەوایی. (٢) هاوشێوەیی؛ چوون یەکی؛ یەکسانی؛ یەک جۆری.
**unify** (ū′nə-fī′), *v.t.* یەکخستن؛ یەک پێگرتن؛ کردن بەیەک.
*v.i.* یەکگرتن؛ بوون بەیەک؛ یەککەوتن.
**-unifier** *(n.)*.
**unilateral** (ū′ni-lat′ẽr-əl), *adj.* (١) یەکلایی؛ تایبەتی بە یەکلا.
(٢) یەکلایی؛ تەنها لە یەک لاوە: *( ~ disarmament)* .
(٣) تەنها یەک لای مەسەلەیەك پیشان دەدات.
(٤) یەکلا؛ تەنها یەک لای هەیە؛ یەکلایی.
(٥) بنەچەی تەنها باوك یا دایك سۆراخ دەکات
(٦) یەکلایی: تەنها لە لایەکی لاسکەوە ڕوواو (گەڵا).
**-unilaterally** *(adv.)*.
**unilingual** (ū′ni-liŋ′gwəl), *adj.* یەک زمان؛ یەک زمانی؛
یەک زمان زان؛ بە یەک زمان نووسراو.
**unimaginable** (un′i-maj′i-nə-b'l), *adj.* نایەتە بەرچاو؛
سەیر؛ بڕوا ناکرێت هەرگیز ڕووبدات یا ڕووی دابێت.
**unimpeachable** (un′im-pēch′ə-b'l), *adj.* بێ گەرد؛
ڕەخنەی لێ ناگیرێت؛ گومانی لێ ناکرێت.
**unimproved** (un′im-proovd′), *adj.* (١) چاك نەبووە؛
چاکتر نەبووە یا نەکراوە؛ هەر وەك خۆیەتی.
(٢) کشتوکاڵ تێدا نەکراو؛ خانوو تێدا نەکراو: *( ~ land)* .
(٣) سوود لێ وەرنەگیراو. (٤) تەندرووستی باشتر نەبووە.
**unimportant** (un′im-pôr′t'nt), *adj.* ناگرنگ؛ بێ بایەخ؛
هیچ‌وپووچ.
**uninformed** (un′in-fôrmd′), *adj.* (١) بێ ئاگا؛ نەزان.
(٢) نەزان؛ تێنەگەیشتوو.
**uninhabitable** (un′in-hab′i-tə-b'l), *adj.* بۆ تێدا ژیان ناشێت.
**uninhabited** (un′in-hab′i-tid), *adj.* چۆڵ؛ کەسی تێدا ناژی.
**unintelligent** (un′in-tel′ə-jənt), *adj.* نازیرەك؛ بێ مێشك.
**unintelligible** (un′in-tel′i-jə-b'l), *adj.* لێڵ؛

ناتوانیت تێی بگەیت.
**unintentional** (un´in-ten′shən-'l), *adj.* بێ ئەنقەست؛ بە ڕێکەوت
**-unintentionally** *(adv.)*.
**uninterested** (un-in′tĕr-is-tid, un-in′tris-tid), *adj.* (١) -( ~ **in** ) نارەزوو لێ نەبوو؛ بێ هەوەس؛ حەز لێ نەکردوو.
(٢) سەرنج نەدەر؛ گوێ پێ نەدەر.
**uninteresting** (un-in′tĕr-is-tiŋ, un-in′tris-tiŋ), *adj.* سەرنج ڕانەکێش؛ ناخۆش: *( an ~ book, film, person, town, etc)*.
**uninterrupted** (un-in´tə-rup′tid), *adj.* بەردەوام؛ سەروەمڕ؛ بێ وەستان
**uninvited** (un´in-vī′tid), *adj.* بانگ نەکراو.
**union** (ūn′yən), *n.* (١) لێکدان؛ یەکگرتن. (٢) یەکێتی.
(٣) نیشانەی یەکێتی (وەك لە ئاڵادا دەردەخرێت).
(٤) یەکێتی کرێکاران؛ نەقابە؛ جفات.
(٥) ئامێری بەیەکگەیاندن (وەك هی بەیەکگەیاندنی دوو بۆری).
(٦) (ا) ژن هێنان و شووکردن. (ب) جووت بوون؛ جووت گرتن؛ گان.
*adj.* (١) هی یەکێتی کرێکاران.
(٢) [-U]، هی یەکێتی ویلایەتەکانی ئەمەریکا لەکاتی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا *( The U~ flag, army, etc.)*.
**the Union,** = **The United States of America.**
**union card,** پێناسەی یەکێتی کرێکاران.
**unionism** (ūn′yən-iz'm), *n.* (١) بیروباوەڕو بنچینەی یەکێتی (بەتایبەتی هی کرێکاران). (٢) لایەنگری یەکێتی کرێکاران؛ یەکێتی خوازی.
(٣) [-U]، یەکێتی خوازی: لایەنگری یەکێتی ویلایەتەکانی ئەمەریکا لە کاتی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا.
**unionist** (ūn′yən-ist), *n.* (١) لایەنگری یەکێتی کرێکاران؛ یەکێتی خواز. (٢) ئەندامی یەکێتی کرێکاران.
(٣) [-U]، یەکێتی خواز: لایەنگری یەکێتی ویلایەتەکانی ئەمەریکا لەکاتی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکادا.
(٤) [-U]، یەکێتی خواز لە ئینگلتەرەو ئێرلەندە.
(٥) [-U]. ئەندامی حیزبی کۆنەپەرستانی بەریتانیا.
**unionize** (ūn′yən-īz´), *v.t.* (١) یەکێتی (کرێکاران) پێکهێنان؛ یەك پێگرتن لە یەکێتی کرێکاراندا. (٢) کردن بە ئەندامی یەکێتی کرێکاران؛ ڕێکخستن لەم یەکێتی‌یەدا.
*v.i.* (١) یەکێتی کرێکاران پێکهێنان؛ خۆ ڕێکخستن لە یەکێتی‌یەکی وەهادا.
(٢) چوونە ناو ئەم یەکێتی‌یەوە؛ بوون بە ئەندامی ئەم یەکێتی‌یە.
**-unionization** *(n.)*.
**union jack,** (١) ئاڵای یەکێتی. (٢) [-U- J]، ئاڵای بەریتانیا.
**Union of Soviet Socialist Republics,** یەکێتی سۆڤیەت
**union shop,** کارگەی یەکێتی: کارگەیەکە تەنها ئەندامانی یەکێتی کرێکاران بە کرێ دەگرێت.
**union suit,** دەرپێ و فانیلەی یەك پارچە
**unipod** (ū′ni-pod´), *n.* یەکپا؛ پاڵپشتی یەکپا
**unipolar** (ū′ni-pō´lĕr), *adj.* یەك جەمسەر (فیزیا، تونێکاری).
**unique** (ū-nēk′), *adj.* (١) تاك؛ تەنها؛ تاق.
(٢) بێ هاوتا؛ بێ وێنە؛ یەکتا؛ نایاب؛ تایبەتی.
**-uniquely** *(adv.)*; **uniqueness** *(n.)*.
**unisexual** (ū´ni-sek′shōō-əl), *adj.* (١) diclinous.
(٢) تاك ڕەگەز؛ تەنها ئەندامی نێرینە یا مێینەی هەیە.
**unison** (ū′nə-s'n, ū′nə-z'n), *n.* (١) هاوئاوازی؛ هاودەنگی؛ یەك ئەوایی. (٢) ڕێکەوتن؛ کۆکی؛ یەك دەنگی؛ گونجان؛ یەك بوون.
**in unison,** بەیەك دەنگ؛ هەموو پێکەوە:
*( to sing in unison; to act in unison)*
**unisonous** (yoo-nis′ə-nəs), *adj.* *Also* **unisonal.** (١) هاودەنگ؛ هاوئاواز؛ یەك ئەوا. (٢) پێکەوە گونجاو؛ یەك دەنگ.
**unit** (ū′nit), *n.* (١) یەك. (٢) دانە (شت، کەس)؛ پارچە؛ کەرت.
(٣) کۆمەڵ. (٤) تیپ (سوپا)؛ دەستە: *( a military ~ )*.
(٥) پێوانە؛ یەکەی پێوان یا کێشان:
*( a ~ of electricity; The meter is a ~ of length and so is the foot.; The gramme is a ~ of weight.; a three- ~ course in college )*
**Unitarian** (ū´nə-târ′i-ən), *n.* (١) یەك خواناس؛ یەك خواپەرست؛ کەسێکە کە بڕوای بە خوایەتی عیسا و " سیانەی پیرۆز "ی خاچ پەرستی نی‌یە، بەڵکو بڕوای بە تاکە خوایەکە
(٢) ئەندامی کۆمەڵێکی خاچ پەرستی یەك خواناس.
*adj.* تایبەتی بە یەك خواناسەکان و بیروباوەڕیان.
**-Unitarianism** *(n.)*.
**unitary** (ū′nə-ter´i), *adj.* (١) تایبەتی بە یەکێتی یا یەکگرتن؛ یەکێتی. (٢) تەواو؛ گشت؛ کۆ؛ هەموو؛ یەك پارچە.
(٣) پێوانەیی؛ کێشانە؛ هی یەکەی پێوان یا کێشان.
**unite** (yoo-nīt′), *v.t.* (١) یەك پێگرتن؛ کردن بەیەك؛ یەکخستن؛ لێکدان.
(٢) بەیەك گەیاندن وەك ژن و مێرد؛ کردن بە هاوسەر؛ بوون بە یەك.
(٣) چەند تایبەخۆیەك تێدا بوون یا تێدا کۆبوونەوە:
*( He ~s common sense with compassion.)*
(٤) پێکەوە نووساندن؛ پێوە نووساندن.
*v.i.* (١) یەکگرتن؛ بوون بەیەك؛ لێکدان. (٢) هاوکاری کردن.
(٣) پێکەوەنووسان؛ پێوەنووسان.
**unite** (ū′nīt, yoo-nīt′), *n.* پارەیەکی زێڕی کۆنی ئینگلیزی‌یە.
**united** (yoo-nīt′id), *adj.* (١) یەکگرتوو: *( the U~ Kingdom)*.
(٢) یەك؛ کۆك؛ پێکەوە گونجاو: *( a ~ family, people, etc.)*
(٣) پێکەوە؛ هاوبەش؛ یەکگرتوو: *( to make a ~ effort)*.
**United Nations,** کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان.
**United States of America,** ئەمەریکا؛ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
**unitive** (ū′nə-tiv), *adj.* (١) یەك پێگرتوو (٢) یەك؛ یەکگرتوو.
**unity** (ū′nə-ti), *n.* (١) یەکێتی؛ یەکگرتن.
(٢) کۆکی؛ پێکەوە گونجان؛ ڕێککەوتن. (٣) یەك؛ ژمارە یەك.
(٤) پەیوەستی (وێژە)؛ هاوپەیوەندی بەرهەمێکی وێژەیی یا شانۆگەری.
**univalent** (ū′nə-vā′lənt, yoo-niv′ə-lənt), *adj.* (١) تاك- هاوهێز (کیمیا). (٢) تاکە کرۆمۆسۆم (زگماکی ناسی)
**univalve** (ū′nə-valv´), *n.* (١) گیانەوەری قاوغ یەك پارچە (وەك شەیتانۆکەی باخچە). (٢) قاوغی یەك پارچە (وەك هی قاقلەجنۆکە).
*adj.* (١) قاقلە یەك پارچەیی.
(٢) یەك دەمەوانە (وەك قاقلە شەیتانۆکەی باخچە).
**universal** (ū´nə-vūr′s'l), *adj.* (١) گشتی؛ هەموو؛ هەموویی؛ گشتگر (٢) جیهانی؛ سەرزەمینی. (٣) گەردوونی.
(٤) یەك پارچە؛ کۆ. (٥) فراوان (لە شارەزایی و زانیاریدا).
(٦) هەموو کەس بەکاری دەهێنێت یا لێی تێ دەگات.
(٧) بە هەموو قەبارەیەك دەکات (مەکینەکاری)؛ لەگەڵ هەموو قەبارەیەکدا دەگونجێت.
*n.* (١) بیروباوەڕێکی گشتی (ژیربێژی).
(٢) ئەوەی ئەم بیروباوەڕە دەیگرێتەوە.
**-universally** *(adv.)*; **universalness** *(n.)*.
**Universalism** (ū´nə-vūr′s'l-iz'm), *n.* (١) گشتێتی: بیروباوەڕێکی ئاینی‌یە دەڵێت کە لە ئەنجامدا خوا لە هەموو کەس خۆش دەبێت و دەچێتە بەهەشت. (٢) **universality**.
**-universalist** *(n.)*.
**universality** (ū´nə-vĕr-sal′ə-ti), *n.* (١) گشتێتی؛ هەموویی؛ هەموو گرتنەوە؛ جیهانێتی؛ گشتگری.

*( the ~ of suffering, pain, and death)*

(۲) هەمە توانایی؛ لێهاتوویی لە هەمووشتێکدا.

**universalize** (ū´nə-vūr′s'l-īz´), *v.t.* جیهانی کردن؛ کردن بە گشتی؛ بە جیهاندا بلاوکردنەوە.

**-universalization** *(n.).*

**universally** (ū´nə-vūr′s'l-i), *adv.* (۱) لە هەمووشوێنێکدا؛ لە هەموو جیهاندا (۲) هەموو کات؛ هەموو جار؛ هەمیشەیی؛ بەگشتی.

**universe** (ū′nə-vūrs´), *n.* (۱) گەردوون. (۲) جیهان؛ سەرزەمین؛ زەمین؛ دونیا

**university** (ū´nə-vūr′sə-ti), *n.* زانکۆ؛ زانستگا

**unjust** (un-just′), *adj.* (۱) نارەوا؛ بێ وبژدان؛ نایەکسان؛ ناهەق. (۲) [Archaic]. ناپاك؛ نادلسۆز

**-unjustly** *(adv.)*; **unjustness** *(n.).*

**unjustifiable** (un-jus´tə-fī′ə-b'l), *adj.* نارەوا؛ بێ بەڵگە؛ ناهەق.

**unjustified** (un-jus′tə-fīd´), *adj.* نارەوا؛ بێ بەڵگە؛ ناهەق.

**unkempt** (un-kempt′), *adj.* (۱) دانەهێنراو (قژ)؛ بژ. *( ~ hair)*. (۲) شڕپۆش؛ شڵوشێواو؛ ناڕێکوپێک؛ پنتی؛ پیس‌وپۆخڵ: *( ~ clothes; an ~ lawn)* (۳) بێ نەزاکەت؛ نەزان (لە ڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە)؛ قسەڕەق.

**unkenned** (un-kend′), *adj.* [Obs. or Dial.]. نەزانراو؛ نەبیسراو؛ سەیر

**unkennel** (un-ken′'l), *v.t.* (۱) (ا) لە کولانە بەرەلاکردن (سەگ، تانجی)؛ بەردان. (ب) لە کون یا لانە دەرپەڕاندن؛ لە کون دەرهێنان. (۲) دەرخستن؛ هەڵماڵین؛ خستنەڕوو

*v.i.* لە کولانە هاتنەدەرەوە؛ لە کون هاتنەدەرەوە.

**unkind** (un-kīnd′), *adj.* دڵڕەق؛ بێ بەزەیی

**-unkindness** *(n.).*

**unkindly** (un-kind′li), *adv.* بەدڵڕەقانە؛ بەبێ بەزەیی‌یانە

*adj.* دڵڕەق؛ بێ بەزەیی.

**unknit** (un-nit′), *v.t.* (۱) هەڵوەشاندن (شتی چنراو)؛ شل کردنەوە؛ کردنەوە (۲) چرچ‌ولۆچ تێدا نەهێشتن.

**unknowable** (un-nō′ə-b'l), *adj.* ناتوانرێت بزانرێت؛ لە تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەرە.

*n.* شتێکە کە لە تێگەیشتنی مرۆڤ بەدەربێت؛ شتێکە کە نەتوانرێت بزانرێت.

**unknowning** (un-nōn′iŋ), *adj.* بێ ئاگا؛ نەزان؛ بێ نەزانیو؛ نائاگادار

**-unknowningly** *(adv.).*

**unknown** (un-nōn′), *adj.* (۱) نەزانراو؛ نەبیستراو؛ نەناسراو. (۲) (ا) نەدۆزراوە (ب) دیاری نەکراو؛ نەدیار.

*n.* (۱) کەسێکی نەناسراو؛ کەس نەناس؛ کەس نەزان؛ شتێکی نەزانراو. (۲) هەندی نرخ نەزانراو (بیرکاری).

**Unknown Soldier,** سەربازی گومناو؛ سەربازی بێ ناو

**unlace** (un-lās′), *v.t.* (۱) شل کردنەوە (قەیتانی جل‌وبەرگ). (۲) جل‌وبەرگ داکەندن (بە قەیتان شل کردنەوە). (۳) [Obs.]. ئابڕوو بردن.

**unlade** (un-lād′), *v.t. & v.i.* (۱) بارداگرتن (کەشتی). (۲) بارداگرتن‌و بەرەلاکردن.

**unlash** (un-lash′), *v.t.* شل کردنەوە؛ کردنەوە.

**unlatch** (un-lach′), *v.t.* کردنەوە (بە کردنەوەی ئەڵقەڕێن

*v.i.* کرانەوە

**unlawful** (un-lô′fəl), *adj.* (۱) قەدەغە؛ یاساغ؛ نادرووست (۲) زۆڵ.

**unlay** (un-lā′), *v.t.* گوریس یا بەت ڕەواندنەوە؛ هەڵوەشاندنەوە؛ تاڵ تاڵ کردن

*v.i.* ڕەوانەوە؛ ڕەوینەوە؛ تاڵ تاڵ بوون؛ شیبوونەوە

**unleaded** (un-led′id), *adj.* (۱) قوڕقوشم تێنەکراو (۲) دێڕەکانی بە قوڕقوشم جیا نەکراوەتەوە (چاپ).

**unlearn** (un-lūrn′), *v.t.* لە بیر خۆ بردنەوە (شتێکی بە هەڵە فێربوو)؛ وازلێهێنان (خوو، شتی هەڵە)

**unlearned** (un-lūr′nid), *adj.* (۱) نەزان؛ نەخوێندەوار. (۲) نەزانی پیشان دەدات. (۳) باش فێرنەبوو؛ باش نەچووەتە مێشکەوە: *( ~ lessons)* . (٤) بە زگماکی زانراو؛ زانراوە بەبێ فێربوون یا فێرکردن: *( an ~ response)*

**unleash** (un-lēsh′), *v.t.* بەرەلاکردن؛ بەردان؛ پەت بۆ بەرەلاکردن؛ بەر بۆ بەرەلاکردن.

**unleavened** (un-lev′'nd), *adj.* هەڵنەهاتوو؛ هەویرترش تێنەکراو: *( ~ bread)*

**unless** (ən-les′), *conj.* مەگەر؛ ئەگەر وانەبێ: *( You will fail ~ you work hard.; This baby seldom cries ~ he is hungry.)*

*prep.* جگە لە؛ بێجگە لە.

**unlettered** (un-let′ẽrd), *adj.* (۱) (ا) نەزان؛ ناڕۆشنبیر (ب) نەخوێندەوار. (۲) هیچ لەسەر نەنووسراو (وەك کێل).

**unlike** (un-līk′), *adj.* (۱) جیا؛ جیاواز؛ لەیەك ناچن: *( The two books are quite ~ .)* (۲) ناهاوتا؛ نایەکسان: *( They contributed ~ amounts.)*

*prep.* (۱) جیا؛ جیاواز. (۲) لێ نەوەشاوە؛ نەگونجاو لەگەڵ (ڕەووشت): *( This behavior was quite ~ her.)*

**unlikelihood** (un-līk′li-hood´), *n.* ڕێ تێ نەچوون؛ لەوانە نەبوون؛ بۆ نەبوون.

**unlikely** (un-līk′li), *adj.* (۱) ڕێی تێ ناچێ؛ بۆی نی‌یە؛ لەوانە نی‌یە. (۲) هیوای سەرکەوتنی لێ ناکرێ. (۳) ناپەسەند؛ بەد.

**unlimber** (un-lim′bẽr), *v.t.* (۱) تۆپ ئامادەکردن بۆ تەقاندن (بە لێکردنەوەی لە عەرەبانەکەی). (۲) ئامادەکردن بۆ ئیش یا بۆ بەکارهێنان.

**unlimited** (un-lim′it-id), *adj.* (۱) بێ سنوور. (۲) بێ ئەندازە؛ بێ ڕادە؛ بێ شومار؛ بێ پایان. (۳) ڕەها؛ تەواو.

**unlink** (un-liŋk′), *v.t.* کردنەوە (زنجیر)؛ لێك جیاکردنەوە.

**unlisted** (un-lis′tid), *adj.* لە لیستەدا نی‌یە؛ نەخراوەتە لیستەوە.

**unload** (un-lōd′), *v.t.* (۱) بار لێ داگرتن؛ داگرتن. (۲) (ا) لە کۆڵ (خۆ) کردنەوە (ئەرکی سەرشان، ناخۆشی)؛ بار سووك کردن. (ب) دڵی خۆ بۆ هەڵڕشتن. (۳) گوللە هەموو لێ دەرهێنان؛ چەك بەتاڵ کردنەوە. (٤) لە بازاڕدا هەڵڕشتن (فرۆتەنی)؛ هەموو فرۆشتن؛ خۆ لێ ڕزگار کردن: *( The grocer is ~ing his supply of sugar.)*

*v.i.* بارداگرتن؛ بارخستن؛ لە کۆڵ بوونەوە.

**unlock** (un-lok′), *v.t.* (۱) کردنەوە (قفل). (۲) (ا) کردنەوە (دەرگا). (ب) کردنەوە: *( to ~ her heart)* . (۳) بەرەلاکردن؛ بەردان. (٤) دۆزینەوە؛ هەڵهێنان؛ ڕوونکردنەوە؛ هەڵماڵین؛ لێکدانەوە: *( to ~ a mystery)*

*v.i.* کرانەوە.

**unlooked-for** (un-lookt′fôr´), *adj.* چاوەڕوان نەکراو؛ بەتەما نەبوو؛ بۆ نەگەڕاو.

**unloose** (un-lōōs′), *v.t.* (۱) بەرەلاکردن؛ بەردان؛ کردنەوە. (۲) شل کردنەوە؛ خاوکردنەوە.

**unloosen** (un-lōōs′'n), *v.t.* = **unloose.**

**unlovely** (un-luv′li), *adj.* ناشرین؛ ئێسك قورس؛ پیس؛ ناپەسەند؛ ناخۆش.

**unluckily** (un-luk′'l-i), *adv.* بۆ بێ بەختی؛ بۆ بەدبەختی.

**unlucky** (un-luk′i), *adj.* (۱) بێ بەخت؛ بەدبەخت؛ نەگبەت؛ کوڵۆڵ؛

**-uria** (yoor′i-ə), پاشگرێکە بەمانای: نەخۆشی میز:
*( pyuria, albuminuria)*
**uric** (yoor′ik), *adj.* میزی؛ تایبەتی بە میز.
**uric acid,** ترشی میز؛ ترشی یوریک
**urinal** (yoor′ə-n'l), *n.* میزدان. (١) دەفری میزتێکردنی پێشاو. (٢) دەفرێکە نەخۆشی کەفتەکار لە جێگەدا میزی تێ دەکات.
**urinalysis** (yoor′ə-nal′ə-sis), *n. Also* **uranalysis,** میز شیکردنەوە
**urinary** (yoor′ə-ner′i), *adj.* (١) میزی؛ تایبەتی بە میز. (٢) تایبەتی بە ئەندامی میز دەردان و میزکردن
*n.* (١) urinal.
(٢) میزخانە عەماری میزی ئاژەڵ و وڵاخ (بۆ بەکارهێنان وەك پەین).
**urinary bladder,** میزەڵدان.
**urinary calculus,** بەردی بۆری میز. (هەروەها " urolith ")
**urinary tract,** بۆری میز؛ میزڕەو.
**urinate** (yoor′ə-nāt′), *v.i.* میزکردن
**urination** (yoor′ə-nā′shən), *n.* میزکردن.
**urine** (yoor′in), *n.* میز
**uriniferous** (yoor′ə-nif′ēr-əs), *adj.* میزبەر.
**urino-** (yoor′ə-nō, yoor′ə-nə), *Also* **urin-,** پێشگرێکە بەمانای: میز *( urinogenital)* .
**urinogenital** (yoor′ə-nō-jen′ə-t'l), *adj.* = **urogenital.**
**urinous** (yoor′ə-nəs), *adj. Also* **urinose,** (١) میزی؛ تایبەتی بە میز (٢) بۆنی میزی لێ دێت.
**urn** (ũrn), *n.* (١) کووپە (بەتایبەتی بۆ هەڵگرتنی خۆڵەمێشی لاشەی مردووی سووتێنراو). (٢) گۆزە. (٣) دەفرێکی گەورەیە وەك سەماوەر بۆ چاو قاوە تێکردن بەتایبەتی لە چێشتخانەدا؛ سەماوەر.
**uro-** (yoor′ō, yoor′ə), *Also* **ur-,** پێشگرێکە بەمانای: میز؛ بۆری میز: *( urine, urogenital)* .
**uro-** (yoor′ō, yoor′ə), پێشگرێکە بەمانای کلك: *( uropygium)* .
**urogenital** (yoor′ō-jen′ə-t'l), *adj. Also* **urinogenital,** هی میزکردن و جووت بوون.
**urolith** (yoor′ə-lith), *n.* urinary calculus.
**urologic** (yoor′ə-loj′ik), *adj. Also* **urological.** هی پزیشکەوانی میز و بۆری میز.
**urologist** (yoo-rol′ə-jist), *n.* پزیشکی بۆری میز؛ پسپۆری بۆری میز و نەخۆشییەکانی.
**urology** (yoo-rol′ə-ji), *n.* پزیشکەوانی میز و بۆری میز؛ زانستی بۆری میز و نەخۆشییەکانی.
**uropygium** (yoor′ə-pij′i-əm), *n.* کلێنچکەی باڵندە؛ جێگەی رووانی پەڕی کلکی باڵندە.
**-uropygial** *(adj.).*
**uroscopy** (yoo-ros′kə-pi), *n.* میز شیکردنەوە بە گەردبین (پزیشکەوانی).
**Ursa Major,** وورچی گەورە؛ حەوتەوانە؛ حەوتەبرا؛ ناوی کۆنەستێرەیەکە. (هەروەها پێی دەووترێ: " Great Bear ").
**Ursa Minor,** وورچی بچکۆلە؛ حەوتەوانەی بچووك؛ ناوی کۆنەستێرەیەکە. (هەروەها پێی دەووترێ: " Little Bear ").
**ursiform** (ũr′sə-fôrm′), *adj.* لە وورچ دەچێت.
**ursine** (ũr′sīn, ũr′sin), *adj.* (١) وورچی: تایبەتی بە وورچ؛ وەك وورچ وایە. (٢) درکاوی (گیانەوەرناسی).
**urticaria** (ũr′tə-kâr′i-ə), *n.* لیری ئاڵۆشاوی؛ لیر؛ نەخۆشییەکی هەستیارییە دەبێتەهۆی پێست خوران و لیر لێ هاتنی. (هەروەها " hives " و " uredo ")
**urticate** (ũr′tə-kāt′), *v.t.* درك پێدکردن

**urtication** (ũr′tə-kā′shən), *n.* (١) بە درك ئاژنینەوە یا لێدانی ئەندامی سڕ یا ووشك بووی لەش بۆ هەست تێدا پەیداکردنەوە و چاك کردنەوەی (پزیشکەوانی). (٢) چووزانەوە (وەك هەستی درك پیاکران یا هەنگ پێوەدان). (٣) **uriticaria** .
**urus** (yoor′əs), *n.* = **aurochs.**
**us** (us), *pron.* ئێمە؛ خۆمان.
**usability, useability** (ūz′ə-bil′ə-ti), *n.* بۆ بەکارهێنان شیان.
**usable, useable** (ūz′ə-b'l), *adj.* بۆ بەکارهێنان شیاو؛ بەکاردێت؛ دەتوانرێ بەکاربهێنرێت.
**usage** (ūs′ij, ūz′ij), *n.* (١) بەکارهێنان. (٢) خوو و نەریت؛ نەریت. (٣) شێوەی بەکارهێنانی ووشە و ووتە (زمانەوانی):
*( a grammar based on ~ rather than on arbitrary rules of correctness; contemporary English ~ )*
**usance** (ūz′'ns), *n.* (١) ماوەی قەرزدانەوەی نێو وولاتان. (٢) [Obs.]، بەکارهێنان. (٣) [Obs.]، خوو و نەریت؛ نەریت (٤) [Obs.]، سوود؛ سوو؛ قازانج.
**use** (ūz), *v.t.* (١) بەکارهێنان؛ ئیش پێکردن؛ کەڵك لێ وەرگرتن. (٢) لەگەڵ جووڵانەوە؛ رەفتارکردن لەگەڵدا:
*( She ~d her friends badly.)*
(٣) ( **up** ~ )، هەموو بەکارهێنان؛ بەکارهێنان:
*( We ~ed a lot of water yesterday.; He ~ed up all his energy.)*
(٤) جگەرەکێشان؛ تووتن جووین (ئەمە خوویەکی ئەمەریکییە).
(٥) ( **to** ~ ) راهاتن؛ خوو پێوەگرتن:
*( They were ~ed to the old ways.)*
(٦) [Colloq.]، بەکارهێنان بۆ سوودی خۆ:
*( She ~s all her friends.)*
*v.i.* (١) راهاتن؛ را فێربوون؛ هۆگر بوون:
*( He ~ed to go the movies every weekend.)*
(٢) [Archaic or Dial.]، زوو زوو چوون یا سەرلێدان.
*n.* (١) بەکارهێنان. (٢) توانای بەکارهێنان: *( He has regained the ~ of his hand.)*
(٣) مافی بەکارهێنان؛ رێ دان بە بەکارهێنان:
*( He granted the ~ of his name.)*
(٤) پێویستی بەکارهێنان:
*( We will have no further ~ for his services.)*
(٥) شێوەی بەکارهێنان.
(٦) کەڵك؛ سوود. (٧) مەبەستی بەکارهێنان.
(٨) ئەرك؛ کار. (٩) خوو؛ نەریت؛ راهاتن؛ هۆگری.
(١٠) (ا) بەکارهێنانی زەوی‌وزار و خانووبەروبووم. (ب) مافی ئەم بەکارهێنانە.
**have no use for,** (١) پێویست نەبوون؛ نەویستن؛ بەکەڵك نەهاتن؛ بەکار نەهاتن. (٢) حەز لە چارە نەکردن؛ حەز لێ نەکردن؛ رِق لێ بوون
**in use,** لە بەکارهێناندایە؛ گیراوە؛ ئێستا بەکاردەهێنرێت.
**make use of,** بەکارهێنان؛ کەڵك لێ وەرگرتن.
**come into use,** دەست بە بەکارهێنان کران:
*( When did this word come into use.?)*
**out of use,** بەکارنەهێنراو؛ پەککەوتوو؛ شکاو؛ لە کەڵك کەوتوو.
**put to use,** بەکارهێنان؛ خستنەکار؛ ئیش پێکردن؛ کەڵك لێ وەرگرتن.
**useability** (ūz′ə-bil′ə-ti), *n.* = **usability.**
**useable** (ūz′ə-b'l), *adj.* = **usable.**
**used** (ūzd′), *adj.* کۆنە؛ کۆن؛ نیوداشت؛ بەکارهێنراو: *( a ~ car)* .
**useful** (ūs′fəl), *adj.* بەکەڵك؛ بەسوود؛ سوودبەخش؛ باش.
**-usefully** *(adv.)*; **usefulness** *(n.).*
**useless** (ūs′lis), *adj.* بێ کەڵك؛ بێ سوود؛ بێ فەر؛ بێ خێر؛ قەلب.
**-uselessly** *(adv.)*; **uselessness** *(n.).*

**user** (ūz′ẽr), *n.* (١) بەکارهێنەر (٢) (أ) مافی بەکارهێنان (زەوی‌وزارو خانوو). (ب) بەکارهێنانی ئەم مافە. (٣) [Slang]، حەشیشەخۆر.

**usher** (ush′ẽr), *n.* (١) دەرگاوان.
(٢) رێ پیشاندەری کاربەدەستێکی گەورە یا خەڵك بە یەکتر ناسێن.
(٣) رێ پیشاندەری خەڵك لە سینەماو شانۆو کلێسەدا.
(٤) [Obs.]. یاریدەدەری مامۆستا (لە ئینگلتەرە).

*v.t.* (١) رێ پیشاندان؛ رابەری کردن:
*( He ~ed the ladies to their seats.)*
(٢) دەستپێکردن؛ هێنانە پێشەوە؛ لەگەڵ خۆ هێنان:
*( The new government ~ed in a period of peace and stability.)*

*v.i.* رێ پیشاندان: *( He ~ed at the banquet.)* .

**usherette** (ush′ẽr-et′), *n.* کچی رێ پیشاندەر لە سینەماو شانۆو کلێسەدا. (ژمارە سێی وشەی پێشوو ببینە).

**usquebaugh** (us′kwi-bô′, us′kwi-bä′), *n.* ویسکی (لە سکۆتلەندەو ئیرلەندە).

**ustulate** (us′choo-lit, us′choo-lāt′), *adj.* رەش هەڵگەراو (وەك بە سووتان)؛ هەڵقرچاو.

**ustulation** (us′choo-lā′shən), *n.* (١) ووشك کردنەوە (دەرمانسازی). (٢) شەراب سووتاندن. (٣) سووتاندن؛ هەڵقرچاندن.

**usual** (ū′zhōō-əl, ū′zhool), *adj.* ئاسایی.
**as usual,** بە ئاسایی؛ هەر وەك جاران؛ هەر وەك هەموو کات.

**usually** (ū′zhōō-əl-i, ū′zhoo-li), *adv.* بەئاسایی؛ بەزۆری؛ بەگشتی؛ زۆربەی کات

**usufruct** (ū′zyoo-frukt′, ū′syoo-frukt′), *n.* مافی کەڵك لێ وەرگرتن؛ مافی بەروبووم خواردنی زەوی‌وزارو خانووی کەسێکی تر بەبێ زیان پێ گەیاندنی.

**usufructuary** (ū′zyoo-fruk′chōō-er′i, ū′syoo-fruk′chōō-er′i), *n.* کەسێکە کە بەروبوومی زەوی‌وزارو خانووی کەسێکی تر دەخوات بەبێ زیان پێ گەیاندنی.

*adj.* تایبەتی بەم کەڵك لێ وەرگرتنە.

**usurer** (ū′zhoo-rẽr), *n.* سوو(د) خۆر

**usurious** (ū-zhoor′i-əs), *adj.* (١) سوو(د)خۆر
(٢) تایبەتی بە سوو(د) خواردن.

**usurp** (ū-zũrp′, ū-sũrp′), *v.t. & v.i.* داگیرکردن (تەختی پاشایی، دەسەلاتی فەرمانرەوایی)؛ زەوت کردن:
*( to ~ the throne, the presidency, etc.)*

**usurpation** (ū′zẽr-pā′shən, ū′sẽr-pā′shən), *n.* داگیرکردن (تەختی پاشایی، دەسەلاتی فەرمانرەوایی)؛ زەوت کردن.

**usury** (ū′zhoo-ri), *n.* (١) سوو(د) خواردن؛ سوو(د) خۆری.
(٢) سوو(د)؛ سوو(د)و سەلەم.
(٣) [Archaic]. پارە بە قەرز دان بە قازانج (کەم بێ یا زۆر).
(٤) [Obs.]. ئەم قازانجە.

**utensil** (ū-ten′s'l), *n.* (١) دەفری چێشتخانە؛ قاپ‌وقاچاغ؛ دەفری چێشت لێنان؛ دەفری ناومال: *( Kitchen ~s; cooking ~s)* .
(٢) ئامێر؛ کەرەسە: *( writing ~ ; painting ~ )* .

**uterine** (ū′tẽr-in, ū′tẽr-īn′), *adj.* (١) هی منداڵدان
(٢) دایکی؛ لە دایکەوە *( ~ sisters; ~ brothers)*

**uteritis** (ū-tẽr′i-tis), *n.* ئاوسانی منداڵدان

**utero-** (ū′tẽr-ō, ū′tẽr-ə), *Also* **uter-**, پێشگرێکە بەمانای منداڵدان

**uterus** (ū′tẽr-əs), *n.* منداڵدان

**utile** (ū′til), *adj.* [Obs.], بەکەڵك؛ بەسوود

**utilise** (ū′t'l-īz′), *v.t.* [ British Spelling], = **utilize.**

**utilitarian** (ū-til′ə-târ′i-ən), *adj.* (١) تایبەتی بە کەڵك و بەکەڵك هاتن. (٢) بەکەڵك بوونی شتی لا گرنگە نەك جوانی‌یەکەی؛ کەڵك خواز.
(٣) بۆ کەڵك لێ وەرگرتن کراوە نەك بۆ جوانی.

*n.* کەسێکە کە بەکەڵك بوونی شتی لا گرنگە نەك جوانی‌یەکەی؛ کەڵك خواز.

**utilitarianism** (ū-til′ə-târ′i-ən-iz′m), *n.* (١) بەکەڵکێتی؛ بیروباوەرێکە کە دەڵێت: نرخی شت لە بەکەڵك بوونیایەتی نەك لە جوانی‌یەکەیدا.
(٢) فەلسەفەیەکە دەڵێت: ئەبێ مەبەستی هەموو کارێك خێرو خۆشی گەیاندن بێ بە زۆرترین کەس

**utility** (ū-til′ə-ti), *n.* (١) کەڵك؛ سوود؛ سوودبەخشی؛ بەکەڵکی.
(٢) خێروخۆشی زۆرترین کەس
(٣) شتی بەکەڵك؛ ئامێری بەکەڵك
(٤) شتی بەسوود بۆ گشت خەڵك (وەك ئاو، کارەبا، گاز، تەلەفۆن... هتد).
(٥) کۆمپانیای یەکێك لەم شتە بەکەڵکانە؛ دەزگایەکی بەرژەوەندی گشتی:
*( a ~ company)*
(٦) *(pl.)* بەشی بەشدارانی کۆمپانیایەکی وەها (بازاری پارەبازی).
(٧) پێویستی جێبەجێکردنی هەموو کەس.

*adj.* (١) دەتوانێ جۆرەها ئەرك ببینێ. (٢) گەنك؛ رەشۆکی: *( ~ beef)* .
(٣) بەکەڵکە نەك جوان؛ بۆ سوود لێ وەرگرتن کراوە نەك بۆ جوانی.
(٤) بۆ بەکارهێنانی گشتی؛ گەلێك ئیشی پێ دەکرێت: *( a ~ knife)* .

**utilize** (ū′t'l-īz′), *v.t.* بەکارهێنان؛ کەڵك لێ وەرگرتن؛ سوود لێ وەرگرتن:
*( He ~s his time very well.)*
-utilizable *(adj)*; utilization *(n.)*; utilizer *(n.)*.

**utmost** (ut′mōst′, ut′məst), *adj.* (١) دوورترین؛ ئەوپەڕ:
*( the ~ end of the earth)*
(٢) زۆرترین؛ گەورەترین؛ ئەوپەڕ:
*( in ~ danger; a matter of the ~ importance, secrecy, etc.)*

*n.* پەڕی ئەوپەڕ: *( to trust a person to the ~ )* .
**do one's utmost,** زۆر هەوڵدان؛ بە هەموو تواناوە تێکۆشان.

**Utopia** (ū-tō′pi-ə), *n.* (١) یوتۆپیا: (أ) دوورگەیەکی خەیاڵی‌یە کە ژیانی کۆمەلایەتی و رامیاری‌و هەمووشتێکی تری وەك بەهەشت وایە. (مانای ووشەکە " هیچ شوێنێك " دەگەیەنێت بە یۆنانی). (ب) ناوی کتێبێکە " سێر تۆماس موور " لە بابەت ئەم دوورگەیەوە نووسیویەتی ساڵی ١٥١٦.
(٢) [u-]، بەهەشتی سەرزەمین؛ شوێنێك یا باروودۆخێکی رامیاری‌و کۆمەلایەتی پڕ ئاسوودە. (٣) [u-]، بیروباوەرێکی خەیاڵی‌و نموونەیی‌یە بۆ چاك کردنی باری رامیاری‌و کۆمەلایەتی کۆمەڵ

**Utopian** (ū-tō′pi-ən), *adj.* خەیاڵی؛ نموونەیی؛ خەیاڵ پلاوی؛ خەیاڵ پەرستی.

*n.* کەسێکی خەیاڵی یا خەیاڵ پەرست (بەتایبەتی لەرووی چاك کردنی باری کۆمەڵەوە)؛ کەسێکە کە دەڵێت: بەهەشتی سەرزەمین دەتوانرێ بهێنرێتە دی

**utopianism** (ū-tō′pi-ən-iz′m), *n.* بیروباوەری خەیاڵ پەرستی‌و ناکردەنی بۆ چاك کردنی باری رامیاری‌و کۆمەلایەتی کۆمەڵ.

**utricle** (ū′tri-k'l), *n.* (١) توورەکەی گوێی ناوەوە (توێکاری).
(٢) توورەکە (رووەکناسی)؛ میوەی یەك شانەی یەك تۆوی کیسەیی.

**utricular** (ū-tri′kyoo-lẽr), *adj.* (١) توورەکەیی؛ کیسەیی.
(٢) توورەکەدار. (٣) تایبەتی بە منداڵدان.

**utter** (ut′ẽr), *adj.* تەواو؛ رەها؛ بێ ئەندازە؛ ئەوپەری؛ بێ مەرج:
*( ~ darkness; an ~ fool; ~ denial)*

**utter** (ut′ẽr), *v.t.* (١) دەرکردن (پارەی قەڵب)؛ بڵاوکردنەوە؛ خستنە ناو بازارەوە. (٢) بە دەمدا هاتن؛ بێژان؛ دەربرین؛ ووتن؛ لە دەم هاتنەدەرەوە:
*( He didn't ~ a word.)*
(٣) [Obs.]. پیشاندان؛ دەربرین: *( to ~ fear by trembling)* .
(٤) دەرخستن؛ درکاندن؛ خستنەروو؛ ئاشکراکردن.
(٥) [Obs.]، لە چاپ دان؛ بڵاوکردنەوە (٦) [Obs.]، فرۆشتن.
-utterable *(adj.)*; utterer *(n.)*.

**utterance** (ut′ẽr-əns, ut′rəns), *n.* (١) ووتن؛ دەربرین؛ بێژان؛ بە دەمدا هاتن (٢) توانای دەربرین یا ووتن.

(٣) ووتە؛ نقە؛ وورتە؛ فزە.
(٤) [Rare] دەرکردن‌و بلاوکردنەوە (پارەی قەلب)؛ دابەزاندنە ناو بازاڕەوە.
**utterance** (ut′ẽr-əns, ut′rəns), ***n.*** [Obs.], دوایی؛ مردن؛ هەرە دوایی
**utterly** (ut′ẽr-li), ***adv.*** بەتەواوی؛ زۆر
***( ~ bad, good, wrong, evil, etc.)***
**uttermost** (ut′ẽr-mōst′, ut′ẽr-məst), ***adj. & n.*** utmost.
**U-turn** (ū-tûrn′), ***n.*** پێچکردنەوەی وەک U ی ئوتومبیل؛ پێچکردنەوە یا وەرگەڕانەوە بۆ دواوە
**uvea** (ū′vi-ə), ***n.*** ڕەشێنەو پەردەی چاو؛ بەشی ڕەنگداری چاو.
**-uveal** ***(adj.).***
**uveitis** (ū′vi-ī′tis), ***n.*** هەوکردنی پەردەو ڕەشێنەی چاو
**uvula** (ū′vyoo-lə), ***n.*** زمانە بچکۆلە
**uvular** (ū′vyoo-lẽr), ***adj.*** (١) زمانە بچکۆلەیی؛ هی زمانە بچکۆلە.
(٢) بە لەرینەوەی زمانە بچکۆلە یا بە لەیەکدانی بنی زمان‌و زمانە بچکۆلە دەبێژرێت (دەنگناسی).
***n.*** دەنگێکی وەها بێژراو
**uvulitis** (ū′vyoo-lī′tis), ***n.*** هەوکردنی زمانە بچکۆلە
**ux,** [L.], ژن؛ هاوسەر
**uxorial** (uk-sôr′i-əl, ug-zō′ri-əl), ***adj.*** بۆ ژن یا هاوسەر شیاو؛ تایبەتی بە ژن یا هاوسەر
**uxoricide** (uk-sôr′ə-sīd′, ug-zō′rə-sīd′), ***n.*** (١) ژنی خۆ کوژ
(٢) ژنی خۆ کوشتن.
**uxorious** (uk-sôr′i-əs, ug-zō′ri-əs), ***adj.*** ژن (ی خۆ) پەرست؛ ملکەچی ژن؛ مێردی دەستەمۆ
**Uzbek** (uz′bek), ***n. Also*** **uzbeg,** (١) ئوزبێکی؛ هاونیشتمانی‌یەکی ئوزبێکستان (٢) ئوزبێکی؛ زمانی ئوزبێکی.
***adj.*** ئوزبێکی؛ تایبەتی بە زمان‌و کلتوورو گەلی ئوزبێکستان

# V v

**V, v** (vē), *n.* (١) تیپی بیست‌و دووەمی ئەلفوبێی ئینگلیزی‌یە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە: " ڤی "
(٣) (ا) قالبی ئەم تیپە. (ب) ئەم تیپە بە چاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) بیست‌و دووەم؛ نیشانەی ژمارە یا پلەی بیست‌و دووەمی ڕستەیەکە.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی " V ". (٢) بیست‌و دووەم.
**V** (vē), *n.* (١) شتێکی وەك " V ".
(٢) نیشانەی ژمارەی ڕۆمانی‌یە بۆ پێنج (٥).
(٣) نیشانەیە بۆ سەرکەوتن (بە دوو پەنجە دەکرێت وەك: V).
(٤) [Colloq.]، پارەی پێنج دۆلاری.
*adj.* لە " V " دەچێت.
**vacancy** (vā′kən-si), *n.* (١) بۆشی؛ بەتاڵی؛ چۆڵی.
(٢) جێی چۆڵ یا بەتاڵ. (٣) مێشك پووچی؛ بێ مێشکی.
(٤) [Rare]. بێ ئیشی؛ بێکاری؛ دەستبەتاڵی.
(٥) (ا) جێگەی بەتاڵ (فەرمانبەرێتی).
(ب) ماوەی مانەوەی ئەم جێگەیە بە بەتاڵی.
(٦) جێگەی بەتاڵ (خانوو، ئوتێل،... هتد).
**vacant** (vā′kənt), *adj.* (١) بۆش؛ بەتاڵ.
(٢) بەتاڵ (جێگەی فەرمانبەری)؛ پڕ نەکراوەتەوە.
(٣) بەتاڵ (کورسی)؛ چۆڵ؛ نەگیراو:
*( a ~ seat on the bus, in the theatre, etc.)*
(٤) چۆڵ؛ بەتاڵ: *( a ~ room, apartment, house, etc.)*.
(٥) بەتاڵ (کات). (٦) پووچ (مێشك)؛ پووت؛ بۆش.
(٧) (ا) چۆڵ (زەوی)؛ بەکارنەهێنراو: *( ~ land)*.
(ب) بەرەڵا (زەوی).
**vacate** (vā′kāt), *v.t.* (١) (ا) چۆڵ کردن (جێگەی فەرمانبەر).
(ب) چۆڵ کردن: *( to ~ a house)*.
(٢) پووچ کردنەوە؛ بەتاڵ کردنەوە؛ سڕینەوە.
*v.i.* (١) چۆڵ کردن؛ بەجێهێشتن. (٢) [Colloq.]، ڕۆیشتن؛ چوون.
**vacation** (və-kā′shən, vā-kā′shən), *n.* (١) پشوو؛ ووچان:
*( to take a ~ )*
(٢) پشووی دادگا. (٣) [Rarc]، چۆڵ کردن.
*v.i.* (١) پشوودان؛ پشوو وەرگرتن.
(٢) پشوو بردنەسەر: *( He ~s in France.)*.
**vacationer** (və-kā′shən-ēr, vā-kā′shən-ēr), *n.* = vacationist.

**vacationist** (və-kā′shən-ist, vā-kā′shən-ist), *n.* پشوودەر.
**vaccinate** (vak′sə-nāt′), *v.t.* کوتان (دژی سوورێژەو ئاوڵەو... هتد).
*v.i.* کوتان.
**vaccination** (vak′sə-nā′shən), *n.* (١) کوتان. (٢) جێی کوتان.
**vaccine** (vak′sēn, vak′sin), *n.* (١) [Rare]، مانگایی؛ لە مانگاوە وەرگیراو. (٢) تایبەتی بە ئاوڵەی مانگا. (٣) تایبەتی بە کوتان.
*n.* دەرمانی کوتان (دژی ئاوڵەو سوورێژەو نەخۆشی تر).
**vaccinia** (vak-sin′i-ə), *n.* = **cowpox.**
**vacillant** (vas′ə-lənt), *adj.* = **vacillating.**
**vacillate** (vas′ə-lāt′), *v.i.* (١) لارەولارکردن؛ بەم دیوو بەودیودا کەوتن. (٢) هەمیشە گۆڕان.
(٣) دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن.
**vacillating** (vas′ə-lāt′iŋ), *adj.* دوودڵ؛ ڕاڕا.
**vacillation** (vas′ə-lā′shən), *n.* (١) لارەولار؛ لارەولارکردن؛ بەم لاو بەولادا کەوتن. (٢) دوودڵی؛ ڕاڕایی.
**vacillatory** (vas′ə-lə-tôr′i, vas′ə-lə-tō′ri), *adj.* = **vacillating.**
**vacuity** (va-kū′ə-ti), *n.* (١) بۆشێتی؛ بۆشی.
(٢) جێی بۆش؛ بۆشایی؛ بۆشی. (٣) مێشك پووچی؛ بێ مێشکی
(٤) شتی پڕوپووچ‌و بێ مانا.
**vacuolated** (vak′ū-ə-lāt′id), *adj. Also* **vaculate,** بۆشاییدار (زیندەوەرزانی).
**vacuolation** (vak′ū-ə-lā′shən), *n.* بۆشایی پەیدابوون لە شانەی زیندەوەردا.
**vacuole** (vak′ū-ōl′), *n.* بۆشایی شانەی زیندەوەر (کە ئاو یا هەوای تێدایە).
**vacuous** (vak′ū-əs), *adj.* (١) بۆش.
(٢) (ا) پووت (مێشك)؛ بێ مێشك؛ ووشك: *( a ~ mind)*.
(ب) بێ هەست؛ بۆش: *( a ~ stare)*.
(٣) بێ مانا؛ پڕوپووچ. (٤) بێ ئیش‌وکار؛ بەتاڵ؛ وێڵ.
**-vacuously** *(adv.)*; **vacuousness** *(n.)*.
**vaccuum** (vak′ū-əm), *n.* [L.], *pl.*-s; **vacua,** (١) بۆشایی؛ جێی بۆش؛ بۆشی (٢) بۆشایی هەوا لێ دەرهێنراو.
(٣) بۆشایی (مەجاز): *( His death will leave a ~ in our lives.)*.
(٤) **vacuum cleaner**.
*adj.* (١) هی بۆشایی. (٢) هەوا لێ دەرهێنراو. (٣) هەڵمژ.
*v.t.* گسك لێدان (بە گسکی کارەبایی).
*v.i.* گسکی کارەبایی بەکارهێنان.
**vacuum cleaner,** گسکی کارەبایی.
**vacuum guage,** پێوەری پاڵەپەستۆی هەوا یا گاز لە بۆشایی‌یەکدا.
**vacuum pump,** ترومپای هەوا یا گاز دەرهێنان لە بۆشایی‌یەك.
**vade mecum,** شتێکە کە یەکێك هەمیشە لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرێت (وەك ڕابەرنامە).
**vagabond** (vag′ə-bond′), *n.* (١) گەڕۆك؛ لانەواز؛ بێ لانە؛ کەسێکی دەربەدەر یا خانە بە کۆڵ؛ گەڕیدە؛ وێڵ. (٢) کەسێکی خوێڕی؛ سەرسەری؛ کەسێکی بێ ئیش‌وکاری هیچ‌وپووچ.
*adj.* (١) گەڕۆك؛ دەربەدەر؛ خانە بە کۆڵ؛ بێ لانە؛ وێڵ؛ ڕەبەن.
(٢) خوێڕی؛ هیچ‌وپووچ؛ سەرسەری.
*v.i.* سووڕانەوە؛ وێڵ بوون؛ گەڕان.
**vagabondage** (vag′ə-bon′dij), *n.* (١) گەڕۆکی؛ بێ لانەیی؛ خانە بە کۆڵی؛ لانەوازی؛ وێڵی؛ سووڕانەوە.
(٢) خەڵکی بێ لانە یا لانەواز بە گشتی؛ خەڵکی وێڵ.
**vagabondism** (vag′ə-bon-diz′m), *n.* = **vagabondage.**
**vagarious** (və-gâr′i-əs), *adj.* (١) حولحول؛ هەوەسباز.
(٢) گەڕۆك؛ ڕەوەند.

**vagary** (və-gâr′i), *n.* (١) کردەوە یا ڕەووشتی سەیر. (٢) هەوەسی سەیر؛ بیری سەیر. (٣) گۆڕانی کوتوپڕ (بیرورا، ئارەزوو)؛ حولحولیتی؛ هەوەسبازی.

**vagina** (və-jī′nə), *n.* (١) زێ؛ قوز؛ کوز. (٢) کیف (ڕووەکناسی)؛ کالان.

**vaginal** (vaj′ə-n'l, və-jī′n'l), *adj.* (١) زێیی؛ تایبەتی بە قوز. (٢) کیفی (ڕووەکناسی)؛ کالانی.

**vaginate** (vaj′ə-nāt′), *adj. Also* **vaginated,** کیفدار؛ لە کیفدایە.

**vaginectomy** (vaj′ə-nek′tə-mi), *n.* زێ دەرهێنان (نەشتەرگەری)

**vaginitis** (vaj′ə-nī′tis), *n.* هەوکردنی زێ (نەخۆشی).

**vagrancy** (vā′grən-si), *n.* (١) (أ) دالغەلێدان (ب) لە باس لادان (٢) دەربەدەری؛ بێ لانەیی؛ بێ خان‌ومانی؛ گەڕۆکی؛ وێڵی؛ خانە بە کۆڵی. (٣) خوێڕێتی؛ سواڵکەری؛ سەرسەرێتی.

**vagrant** (vā′grənt), *n.* (١) گەڕۆک؛ گەڕیدە. (٢) کەسێکی دەربەدەر یا بێ لانە کە بە سواڵ یا بە دزی خۆ دەژێنێ. (٣) سەرخۆشێک، قەحبەیەک، یا کەسێکی خوێڕیو سەرسەری بێ لانە کە هەمیشە لە کۆڵاندا دەژی.

*adj.* (١) گەڕۆک؛ کۆچەر؛ گەڕیدە. (٢) دەربەدەر؛ وێڵ؛ خانە بە کۆڵ (٣) خوێڕی؛ سەرسەری. (٤) بە هەموو لایەکدا تەرزفڕێدەر. (٥) بەرەڵا

**vague** (vāg), *adj.* (١) ناڕوون: *( a ~ answer; ~ instructions)* . (٢) نادیار؛ لێڵ؛ نائاشکرا؛ نەدیار. (٣) باش دیاری نەکراو؛ گەڵاڵە نەکراو: *( ~ plans)* .

**-vaguely** *(adv.)*; **vagueness** *(n.).*

**vagus** (vā′gəs), *n.* هەستەدەماری سێیەکان‌و گەدە. (پێیشی دەووترێ: " **vagus nerve** " و " **pneumogastric nerve** ").

**vail** (vāl), *v.i.* [Archaic], بەکەڵک بوون؛ بەسوود بوون.

*n.* [Archaic], بەخشیش.

**vail** (vāl), *v.t.* [Archaic], (١) دانەواندن (ئاڵا)؛ نزم کردنەوە؛ شۆڕکردنەوە (٢) شەپقە داکەندن یا بەرزکردنەوە بۆ ڕێز پیشاندان.

**vail** (vāl), *n. & v.t.* [Obs.], = **veil.**

**vain** (vān), *adj.* (١) بۆش؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ بایەخ: *( ~ pomp)* . (٢) بێ سوود؛ بێ کەڵک؛ بەفیڕۆچوو: *( a ~ attempt)* . (٣) لەخۆبایی؛ بەفیز؛ لووت بەرز؛ بە کەش‌وفش. (٤) [Archaic]، بێ مانا.

**-vainness** *(n.).*

**in vain,** (١) بێ سوود؛ بێ کەڵک: *( Their sacrifice wasn't in vain.)* (٢) بە لاقرتێیەوە؛ بە گاڵتەپێکردنەوە؛ بە سووکێیەوە.

**vainglorious** (vān′glôr′i-əs, vān′glō′ri-əs), *adj.* بەفیز؛ زۆر لەخۆبایی؛ تڕزل؛ خۆهەڵکێش؛ فشەکەر.

**vainglory** (vān′glôr′i, vān′glō′ri), *n.* زۆر لەخۆبایی بوون؛ بەفیزی؛ تڕزلی؛ خۆهەڵکێشان؛ فشە.

**vainly** (vān′li), *adv.* (١) بەبێ سوود؛ بەبێ کەڵک؛ بە خۆڕایی. (٢) بەفیزەوە؛ بە کەش‌وفشەوە؛ بە لووت بەرزییەوە.

**vair** (vâr), *n.* فەروە یا کەوڵی جۆرە سمۆرەیەکە.

**valance** (val′əns), *n.* پەردەیەکی کورتە بە لاسەرووی پەنجەرەوە یا بە دەوری چوارچێوەی چەرپایەکدا

**vale** (vāl), *n.* [Poetic], (١) دۆڵ؛ شیوودەرە (هەروەها " **valley** "). (٢) جیهانی پڕ لە خەم‌و خەفەت‌و ناخۆشی: *( this ~ of dross and tears)*

**vale** (vā′li), *interj. & n.* [L.], خواحافیز!؛ خواحافیزی.

**valediction** (val′ə-dik′shən), *n.* (١) خواحافیزی؛ خواحافیزی کردن (٢) ووتاری خواحافیزی.

**valedictorian** (val′ə-dik-tôr′i-ən), *n.* قوتابی خواحافیزکەر: ووتاری خواحافیزی خوێنەرەوە: ئەو قوتابییەیە کە ووتاری خواحافیزی دەخوێنێتەوە لە ئاهەنگی دەرچووندا. (ووشەی: " **salutatorian** " ببینە)

**valedictory** (val′ə-dik′tə-ri), *adj.* هی خواحافیزی؛ لە خواحافیزیدا دەووترێت.

*n.* ووتاری خواحافیزی (کە قوتابی یەکەم دەیخوێنێتەوە لە ئاهەنگی دەرچوونی قوتابییاندا).

**valence** (vā′ləns), *n. Also* **valency,** هاوهێزی (کیمیا)؛ ڤالێنس.

**valentine** (val′ən-tīn′), *n.* (١) یاری ڕۆژی " ڤەلەنتاین "؛ دڵدار یا دەنکی ئەم ڕۆژە. (ووشەی داهاتوو ببینە). (٢) کارتێکە گەنجان لەم ڕۆژەدا دەینێرن بۆ دڵدارەکانیان.

**Valentine's Day, Valentines Day,** جەژنی ڤەلەنتاین (کە ڕێکەوتی چواردەی ڕەشەمێ دەکات‌و گەنجەکان لەم ڕۆژەدا کارتی خۆشەویستی بۆ یارەکانیان دەنێرن).

**valerian** (və-lêr′i-ən), *n.* (١) ڕووەکێکە گوڵی سپی‌و سوورو ئەرخەوانی دەگرێت. (٢) دەرمانێکی هێمن کەرەوەیە لە ڕەگی ئەم ڕووەکە دەردەهێنرێت.

**valet** (val′it), *n.* (١) بەردەستی تایبەتی. (٢) بەردەستی ئوتێل (کە ووردە ئیشی جۆراوجۆری میوانەکان جێبەجێ دەکات وەك: جانتا هەڵگرتن‌و... هتد).

**valet de chambre,** [Fr.], = **valet # 1.**

**valetudinarian** (val′ə-to͞o′də-nâr′i-ən), *n.* (١) کەسێکی- کەفتەکار؛ کەسێکی هەمیشە نەخۆش‌و لە جێگادا کەوتوو. (٢) کەسێکە کە هەمیشە مەراقی تەندروستی خۆی بێ‌و وابزانێ کە نەخۆشە

*adj.* (١) کەفتەکار. (٢) زۆر مەراقی تەندروستی خۆر.

**valetudinary** (val′ə-to͞o′də-ner′i, val′ə-tū′də-neri), *adj.* = **valetudinarian.**

**valiance** (val′yəns), *n. Also* **valiancy,** (١) ئازایی؛ قارەمانی؛ بەجەرگی. (٢) کارێکی ئازایانە؛ ئیشێکی قارەمانانە.

**valiant** (val′yənt), *adj. & n.* ئازا؛ قارەمان؛ بەجەرگ: *( a ~ person or deed)*

**-valiantly** *(adv.)*; **valiantness** *(n.).*

**valid** (val′id), *adj.* (١) یاسایی؛ بەپێی یاسا دەرکراوەو ئیشی پێ دەکرێت: *(a ~ passport)* . (٢) درووست؛ ڕەوا؛ پەسەند: *( a ~ statement, claim, idea, etc.)* . (٣) کاریگەر؛ بەکار. (٤) [Rare]، تەندرووست؛ بەهێزو بازوو؛ تێکسمڕاو.

**-validly** *(adv.)*; **validness** *(n.).*

**validate** (val′ə-dāt′), *v.t.* (١) مۆرکردن؛ پەسەندکردن (بەڵگەنامە): *( to ~ a passport)* (٢) سەلماندن؛ بە ڕەوا پیشاندان؛ بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ چەسپاندن؛ ساغ کردنەوە (ڕاستی شتێك): *( Time ~ed our suspicion.)* .

**-validation** *(n.).*

**validity** (və-lid′ə-ti), *n.* ڕەوایی؛ ڕاستی؛ درووستی؛ بەجێیی؛ ڕاستی‌و درۆیی: *( the ~ of an idea, a claim, etc.)* .

**valise** (və-lēs′), *n.* باوەڵ؛ باووڵ؛ جانتا.

**vallation** (va-lā′shən), *n.* (١) سەنگەر. (٢) سەنگەر بەستن.

**vallecula** (və-lek′yoo-lə), *n.* قلیش (زیندەوەرزانی)؛ هێڵی چاڵ.

**-vallecular** *(adj.)*; **valleculate** *(adj.).*

**valley** (val′i), *n.* (١) دۆڵ؛ شیوودەرە؛ شیو. (٢) چاڵایی نێوان شەپۆل. (٣) ئاوەڕۆی سەربان؛ چاڵایی شوێنی بەیەکگەیشتنی دوو لای سەربانی خانووی ڕۆژئاوایی.

**valonia** (və-lō′ni-ə), *n.* جەوتی داربەڕوویەکە کە پێی دەڵێن: " **valonia oak** "، بۆ پێستە خۆش کردن بەکاردێت.

**valor, valour** (val′ẽr), *n.* ئازایەتی؛ پاڵەوانێتی؛ قارەمانێتی؛ دلێری.

**valorize** (val′ēr-īz′), *v.t. & v.i.* نرخ لەسەر دانانی فرۆتەنێی‌یەك‌و
ڕاگیرکردنی لەلایەن میرییەوە.

**-valorization** *(n.)*.

**valorous** (val′ēr-əs), *adj.* ئازا؛ پاڵەوان؛ چاونەترس؛ دلێر

**valour** (val′ēr), *n.* = valor.

**valuable** (val′yoo-b'l, val′ū-ə-b'l), *adj.* (١) بەنرخ؛ نرخدار
(٢) گرانبەها؛ زۆر بەنرخ: ***(a ~ diamond)***.
(٣) بەسوود؛ بەکەڵك؛ بەنرخ؛ بە بایەخ: ***(~ advice)***.

***n. (pl.)***, شتومەکی بەنرخ (بەتایبەتی هی بچووك وەك خشڵ‌و... هتد).

**-valuableness** *(n.)*; **valuably** *(adv.)*.

**valuate** (val′ū-āt′), *v.t.* نرخ بۆ دانان؛ هەڵسەنگاندن؛ خەملاندن؛
قەبلاندن

**valuation** (val′ū-ā′shən), *n.* (١) نرخ بۆ دانان؛ هەڵسەنگاندن؛
قەبلاندن؛ خەملاندن. (٢) نرخ؛ نرخی قەبڵێنراو یا بۆ دانراو.
(٣) ڕێزلێنان؛ بایەخ؛ بایەخ پێدان؛ بە بەنرخ دانان:
***(His ~ of our work was not high.)***

**valuator** (val′ū-ā′tēr), *n.* خەملێنەر؛ قەبڵێنەر.

**value** (val′ū), *n.* (١) نرخ؛ بەها. (٢) سوود؛ بایەخ؛ کەڵك؛ گرنگی.
(٣) مانای تەواو یا وورد‌ی ووشە. (٤) تۆخی‌و کاڵی ڕەنگ.
(٥) نرخی نیشانەی هاوکێشەیەك (بیرکاری).
(٦) ماوەی ئاوازێکی مۆسیقا. (٧) چۆنێتی دەنگی تیپێك (دەنگناسی).
(٨) *(pl.)* شتی بە بایەخ‌و گرنگ‌و ڕێزلێنراو (کۆمەڵناسی):
***( Their ~s are different from ours.)***

***v.t.*** (١) خەملاندن؛ قەبلاندن؛ نرخ بۆ دانان؛ هەڵسەنگاندن.
(٢) (ا) بایەخ پێدان؛ لە لا بەنرخ بوون؛ بە گرنگ دانان:
***( I ~ health above wealth.)***
(ب) ڕێزلێدان؛ بە بەنرخ دانان. ***( I ~ your friendship.)***.

**valued** (val′ūd), *adj.* (١) خەملێنراو؛ قەبڵێنراو؛ نرخ بۆ دانراو:
***( a hat ~ at ten dollars)***
(٢) بەڕێز؛ بەنرخ ***(a ~ friend)***

**valueless** (val′ū-lis), *adj.* بێ فەڕ؛ بێ نرخ؛ بێ بەها؛ هیچ‌وپووچ.

**valuer** (val′ū-ēr), *n.* [British], خەملێنەر؛ قەبڵێنەر.
(هەروەها " appraiser ").

**valvate** (val′vāt), *adj.* زمانەدار؛ دەمەوانەدار؛ دەمەوانەیی.

**valve** (valv), *n.* (١) [Rare]. تاکی دەروازە یا دەرگا.
(٢) دەرگای بەنداو یا بەست (بۆ ڕێك‌وپێك کردنی ئاو).
(٣) زمانە؛ دەمەوانە؛ پشك؛ توێپەوانە؛ دەمگرە.

***v.t.*** (١) زمانە بۆ کردن؛ دەمەوانە بۆ کردن.
(٢) ڕەوتی ئاو یا شلەی تر ڕێك‌وپێك کردن.

**valvelet** (valv′lit), *n.* = valvule.

**valvular** (val′vyoo-lēr), *adj.* بە زمانە ئیش دەکات؛ دەمەوانەیی؛
پشکدار؛ زمانەدار.

**valvule** (val′vūl), *n. Also* valvula, زمانەی بچووك؛
دەمەوانەی بچووك؛ دەرچە.

**valvulitis** (val′vyoo-lī′tis), *n.* عەوکردنی زمانەی دڵ.

**vamoose** (va-mōōs′), *v.i. Also* vamose, [Slang]. بە پەلە
ڕۆیشتن؛ بە پەلە خۆ کۆکردنەوە‌و ڕۆیشتن

**vamp** (vamp), *n.* (١) سەری پێڵاو؛ سەر لووتی پێڵاو.
(٢) شتی پینەکراو. (٣) پینە
(٤) ئاوازێکی کورتی مۆسیقای دانراو بۆ گۆرانی‌یەك.

***v.t.*** (١) سەری تازە گرتنە پێڵاو؛ تازەکردنەوە. (٢) پینەکردن.
(٣) ئاوازی مۆسیقا دانان بە سەرپێیی

***v.i.*** ئاوازی سادەی مۆسیقا دانان بە سەرپێیی

**vamp** (vamp), *n.* [Slang]. ژنێکی جوانە پیاو تاو دەکات‌و هەڵی
دەفریوێنی‌و ماڵی وێران دەکات

*v.t.* [Slang]. پیاو تاوکردن‌و هەڵفریواندن‌و ماڵ وێران کردن

**vampire** (vam′pīr), *n.* (١) مردوویەکە کە بەپێی ئەفسانە شەو
لە گۆڕەکەی دێتە دەرەوە‌و خوێنی خەڵکی نووستوو دەمژێت؛ جانەوەری
ئەفسانەیی خوێنمژ. (٢) کەسێکی خوێنمژ؛ کەسێکە کە بەبێ ویژدانانە
پارە لە خەڵك دەکێشێتەوە. (٣) (ا) **vamp** (ب) نوێنەرێکی شانۆ یا
سینەمایە کە دەوری ئەم جۆرە ژنە دەبینێت. (٤) **vampire bat**

**-vampiric** *(adj.)*.

**vampire bat**, شەمشەمەکوێرەی خوێنمژ.

**vampirism** (vam′pīr-iz'm, vam′pi-riz'm), *n.* (١) بڕوا بوون
بە ئەفسانەی خێوی خوێنمژ. (٢) خوێن مژین؛ هەڵخەڵەتاندن‌و پارە لێ کێشانەوە
یا ڕووتکردنەوە

**van** (van), *n.* (١) پێشەنگی لەشکر. (٢) پێشەنگ؛ چینی پێشڕەو.

**van** (van), *n.* (١) [Archaic or British Dial.]، پانکەی شەن کردن.
(٢) [Poetic]. باڵ.

**van** (van), *n.* (١) ڤان. ئوتومبیلێکە وەك سالۆن یا واگۆن.
(٢) [British]. فارگۆنی جانتاو باری شەمەندەفەر.

**van** (van, vän), *prep.* [Dutch], خەڵکی ئەو شوێنەیە (سەرناو)؛ – ی.

**vanadic acid**, ترشی ڤانادیك.

**vanadium** (və-nā′di-əm), *n.* ڤانادیۆم: توخمێکی کانزایی
دەگمەنی نەرمی سپی‌یە وەك زیو.

**Vandal** (van′d'l), *n.* (١) [V-]، ئەندامی تیرەیەکی ئەڵمانی‌یە
کە لە سەدەی پێنجەمی پ ز دا ئیسپانیاو باکووری ئەفەریقایان داگیرکردو
ڕۆمایان گرت‌و تالانیان کرد. (٢) وێرانکەر؛ تالانکەر؛ کەسێکە کە ماڵی خەڵك‌و
دەستگای گشتی‌و بازرگانی‌و... هتد تێك‌وپێك دەدات‌و گەلێك جاریش تالانیان
دەکات

*adj.* (١) [V-]، تایبەتی بەو تیرە ئەڵمانی‌یە وێرانکەرە.
(٢) تایبەتی بە کەسێکی وێرانکەر یا تێك‌وپێکدەر.

**vandalism** (van′d'l-iz'm), *n.* تێك‌وپێکدان یا وێران کردنی ماڵی
خەڵك‌و دەستگای گشتی‌و بازرگانی‌و... هتد‌و گەلێك جاریش تالان کردنیان.

**vandalize** (van′d'l-īz′), *v.t.* تێك‌وپێکدان یا وێران کردنی ماڵی
خەڵك‌و دەستگای گشتی‌و بازرگانی‌و... هتد‌و گەلێك جاریش تالان کردنیان:
***( The gang ~ed several buildings including the museum.)***

**vane** (vān), *n.* (١) بانما؛ باپێو؛ کەڵەشێری با (ڕووی هەڵکردنی با پیشان
دەدات). (٢) پەڕەی پانکە؛ پەروانە؛ فرفڕۆکە.
(٣) بەشە پان‌و نەرمەکەی پەڕی باڵندە.

**vanguard** (van′gärd′), *n.* (١) پێشەنگی لەشکر؛ پێش لەشکر؛
بەرایی. (٢) پێشەنگ؛ پێشڕەو.

**vanilla** (və-nil′ə), *n.* ڤانیلا: (ا) ڕووەکێکی خۆ هەڵواسەری ناوچە
گەرمەکانە. (ب) بەری ئەم ڕووەکە کە لە شێوەی کەلووی باریك‌و درێژکۆلەدایە
(ج) بۆنێکە لەم بەرە دەردەهێنرێت‌و خواردنی پێ خۆش دەکرێت

**vanillic** (və-nil′ik), *adj.* تایبەتی بە ڤانیلا یا ڤانیلین.

**vanillin** (van′ə-lin, və-nil′in), *n.* ڤانیلین: ئاوێتەیەکی سپی
بلووری‌یە لەباتی ڤانیلا بەکاردەهێنرێت لە بۆن‌و خواردەمەنی‌و دەرماندا

**vanish** (van′ish), *v.i.* (١) لە چاو وون بوون؛ وون بوون.
(٢) سەرنگووم بوون؛ نەمان؛ فەوتان؛ قرتێکەوتن؛ بە ناخداچوون.
(٣) بوون بە سفر (بیرکاری).

*n.* دەنگی کزی کۆتایی هەندێك تیپە بزوێن (وەك لە " stay "و " pain " دا)
(دەنگناسی).

**vanity** (van′ə-ti), *n.* (١) شتێکی پووچی بێ فەڕ؛ شتی بێ سوود‌و
هیچ‌وپووچ. (٢) بێ سوودی؛ پووتی؛ هیچ‌وپووچی؛ بێ فەڕی.
(٣) لەخۆبایی بوون؛ تڕزل؛ کەش‌وفش؛ فیز.
(٤) هۆی شانازی یا لەخۆبایی بوون. (٥) **vanity case**.
(٦) **dressing table**

**vanity case ( or box ),** جانتای ئارایشت؛ سنووقی ئارایشت.

**Vanity Fair, vanity fair,** (١) جێی خۆ بادان‌و ڕابواردنی

هیچ‌وپووچ. (٢) جیهانی کۆمەڵایەتی بۆش.

**vanquish** (vaŋ′kwish), *v.t.* (١) شکاندن (دوژمن)؛ لەشکری دوژمن؛ بەزاندن. (٢) بەسەردا زاڵبوون؛ بڕپێیدان.

**vantage** (van′tij), *n.* (١) لە پێشەوە بوون؛ بەرتری. (٢) vantage point (٣) advantage # 4.

**vantage ground,** = vantage point.

**vantage point,** باری دەش بۆ بینین، بەرھەڵستی یا هێرش بردن؛ هەڵ لەبار؛ گۆشەی بینینی چاک؛ بارێکە کە لە چاکەی لایەك بێت: *( to survey a valley from the ~ of a high hill)*

**vanward** (van′wērd), *adj.* لە پێشەوە؛ لە پێشەنگدا؛ لە بەرایید.

*adv.* بەرەو پێشەوە؛ بۆ بەردەم

**vapid** (vap′id), *adj.* (١) بێ تام؛ ناخۆش *(~ tea, coffee, etc.; a ~ drink)* (٢) ووشك و ناخۆش؛ بێ تام؛ هیچ‌وپووچ *(~ conversation)*.

**-vapidly** *(adv.)*; vapidness *(n.)*.

**vapidity** (və-pid′ə-ti), *n.* (١) (ا) بێ تامی؛ ناخۆشی (ب) ووشك و ناخۆشی؛ هیچ‌وپووچی. (٢) شتی بێ تام یا ناخۆش.

**vapor** (vā′pēr), *n.* (١) هەڵم؛ هاڵاو. (٢) تەم؛ دووکەڵ. (٣) شتێکی خەیاڵی. (٤) [Archaic] *(pl.)* پەستی؛ دڵتەنگی؛ دڵپەستی؛ ماخۆلیان.

*v.i.* (١) بوون بە هەڵم. (٢) هەڵم و هاڵاو لێ هاتنەدەرەوە. (٣) خۆهەڵکێشان؛ گەزاف لێدان؛ فشەکردن.

*v.t.* (١) کردن بە هەڵم؛ کوڵاندن. (٢) [Archaic] تووشی دڵپەستی یا ماخۆلیا کردن.

**vaporescence** (vā′pēr-es′ns), *n.* هەڵم پەیدا بوون

**vaporescent** (vā′pēr-es′nt), *adj.* هەڵم لێ پەیدا بوو؛ هەڵم لێ هەڵساو

**vaporific** (vā′pēr-if′ik), *adj.* (١) هەڵمی لێ پەیدا دەبێت؛ دەبێتە هەڵم. (٢) هەڵمی؛ هەڵماوی. (هەروەها " vaporous ").

**vaporimeter** (vā′pēr-im′ə-tēr), *n.* پێوەری پەستۆو قەبارەی هەڵم

**vaporing** (vā′pēr-iŋ), *adj.* خۆهەڵکێش؛ فشەچی

*n.* فشە؛ خۆهەڵکێشان؛ گەزاف

**vaporish** (vā′pēr-ish), *adj.* (١) هەڵمی؛ هەڵم و هاڵاوی (٢) پڕ لە هەڵم (٣) زوو دڵی پەست دەبێت یا مەراق دای دەگرێت

**vaporization** (vā′pēr-i-zā′shən), *n.* (١) بوون بە هەڵم؛ کردن بە هەڵم. (٢) چارەسەرکردن بە هەڵم (پزیشکەوانی).

**vaporize** (vā′pēr-īz′), *v.t.* کردن بە هەڵم

*v.i.* بوون بە هەڵم؛ هەڵم لێ هەڵسان.

**vaporizer** (vā′pēr-īz′ēr), *n.* هەڵمکەر؛ هەڵم ساز؛ تۆزکەر؛ ئامێرێکە دەرمانی شلە دەکات بە هەڵم یا تۆز بۆ هەڵمژینی.

**vaporous** (vā′pēr-əs), *adj. Also* vapory, (١) هەڵم لێ هەڵساو. (٢) هەڵماوی؛ هەڵم و هاڵاوی؛ پڕ لە هەڵم؛ لێڵ (٣) هەڵمی؛ لە هەڵم دەچێت (٤) تەنك؛ ناسك *( ~ fabrics)*. (٥) خەیاڵی؛ گەلاَلە نەکراو؛ دیاری نەکراو *( ~ plans, promises, etc.)*.

**vapor pressure ( or tension ),** پەستۆی هەڵم

**vapory** (vā′pēr-i), *adj.* = vaporous.

**vapour** (vā′pēr), *n., v.i. & v.t.* = vapor.

**vaquero** (vä-kâr′ō), *n.* [Sp.]. گاوان؛ شوان

**vara** (vä′rä), *n.* پێوانەیەکی ئیسپانی و ئەمەریکای لاتینییە بریتییە لە ٣٢-٤٣ گری

**variability** (vâr′i-ə-bil′ə-ti), *n.* (١) گۆڕان؛ جیاوازی. (٢) هەمیشە گۆڕان؛ بێ باری

**variable** (vâr′i-ə-b'l), *adj.* (١) هەمیشە گۆڕاو؛ هەمیشە دەگۆڕێ؛ حوڵحوڵ. (٢) دەتوانرێ بگۆڕدرێ؛ دەگۆڕدرێ؛ گۆڕاو. (٣) ڕۆشنییەکەی دەگۆڕێت (ئەستێرە). (٤) لە توخمی خۆ جیا یا لاداو (زیندەوەرزانی). (٥) نرخ گۆڕاو (بیرکاری)؛ نرخی هەمیشەیی نییە.

*n.* (١) شتێکی هەمیشە گۆڕاو؛ شتی بگۆڕ. (٢) variable star. (٣) نیشانەیەکە کە نرخی دەگۆڕێت (بیرکاری). (٤) بای گۆڕاو؛ بای دەمدەمی" بایەکە دەمێك قایمەو دەمێك هێواش (کەشتیوانی).

**-variableness** *(n.)*; **variably** *(adv.)*.

**variable star,** ئەستێرەیەکە ڕۆشنییەکەی دەگۆڕێت.

**variance** (vâr′i-əns), *n.* (١) گۆڕان؛ گۆڕین. (٢) جیاوازی. (٣) ناکۆکی؛ ڕێك نەکەوتن؛ ناڕێکی؛ دەمەقاڵێ؛ مشتومڕ. (٤) نەگونجانی دوو بەڵگەنامەی داوایەك (دادپرسی)؛ جیاوازی نێوان دوو بەڵگەنامە. (٥) ڕێ پێدان بە کردنی شتێکی جیاواز و پێچەوانەی پەیرەو لەلایەن میرییەوە: *( a zoning ~ )*.

**at variance,** (١) ناکۆك؛ ناڕێك؛ ڕێك نەکەوتوو لەسەر مەسەلەیەك: *( Two factions of the party are at variance.)* (٢) نەگونجاو لەگەڵ یەکتر؛ جیا؛ جیاواز: *( The facts are at variance.)*

**variant** (vâr′i-ənt), *adj.* (١) جیا؛ جیاواز (بەتایبەتی لە توخمی خۆ). (٢) بگۆڕ؛ دەگۆڕێت

*n.* شتێکی جیاواز (وەك جونجەکردنی جیا لە ئاسایی ووشەیەك)؛ شێوەی جیاواز.

**variation** (vâr′i-ā′shən), *n.* (١) گۆڕان؛ گۆڕین؛ جیاوازی. (٢) ڕادەی گۆڕان یا جیاوازی: *( a ~ of ten feet in height)* (٣) شتێکی جیاواز لە جۆر یا توخمەکەی خۆی. (٤) گۆڕانی خولگەی ئەستێرە. (٥) (ا) جیاوازی زیندەوەر لە توخمەکەی خۆی (ب) زیندەوەری جیا یا لاداو لە توخمی خۆ. (٦) لادانی دەرزی ڕانوما لە باکوورو باشووری تەواو. (٧) ئاوازێکی دووبارەکراوە بە جیاوازییەکی کەم لەگەڵ وێنە بنچینەییەکەیدا (٨) سەمای یەك کەسی (بالێ).

**-variational** *(adj.)*.

**varicella** (var′ə-sel′ə), *n.* = chicken pox.

**varicellate** (var′ə-sel′it, var′ə-sel′āt), *adj.* گرنج گرنج (قاقلە قەپێلکی گوێچکەماسی).

**varices** (vâr′ə-sēz′), *n. plural of* varix.

**varico-** (var′ə-kō, var′ə-kə), *Also* varic-, پێشگرێکە بەمانای: خوێنهێنەری کشاو یا فراوان بوو: *( varicocele)*.

**varicocele** (var′ə-kō-sēl′), *n.* فراوان بوونی بۆری خوێنهێنەری گونەوێڵە یا هێلکەدان؛ کشانی خوێنهێنەری بۆری تۆماو یا هێلکەدان.

**varicolored** (vâr′i-kul′ērd), *adj.* (١) هەمەڕەنگ؛ ڕەنگاوڕەنگ. (٢) هەمەجۆر؛ جۆراوجۆر؛ هەمەچەشن؛ جیا جیا.

**varicose** (var′ə-kōs′), *adj.* (١) فراوان بوو و پێچاوپێچ (بۆری خوێنهێنەر)؛ کشاو: *( ~ veins)*. (٢) خوێنهێنەرەکانی فراوان بوون یا کشاوون (٣) ئاوسێنەر.

**varicosis** (var′ə-kō′sis), *n.* فراوان بوون یا کشان و پێچ خواردنی خوێنهێنەر.

**varicosity** (var′ə-kos′ə-ti), *n.* (١) varicosis. (٢) (ا) کشان یا ئاوسانی خوێنهێنەر. (ب) تووش بوونی ئەم نەخۆشییە

**varicotomy** (var′ə-kot′ə-mi), *n.* دەرهێنان یا بنەبڕکردنی خوێنهێنەری کشاو (نەشتەرگەری).

**varied** (vâr′id), *adj.* (١) هەمەجۆر؛ جۆراوجۆر؛ جیاواز؛ جۆرەها. (٢) هەمەڕەنگ؛ ڕەنگاوڕەنگ (٣) گۆڕاو؛ دەستکاری کراو.

**-variedly** *(adv.)*.

**variegate** (vâr′i-ə-gāt′, vâr′i-gāt′), *v.t.* (١) ڕەنگ گۆڕین؛

هەمەڕەنگ کردن؛ ڕەنگاوڕەنگ کردن؛ شێوە گۆڕین بە هێڵی ڕەنگاوڕەنگ پیاهێنان (٢) جۆراوجۆرکردن؛ هەمەجۆرکردن.

**variegated** (vâr′i-ə-gāt′id, vâr′i-gāt′id), *adj.* (١) هەمەڕەنگ؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ خاڵ خاڵ (٢) هەمەجۆر؛ جۆراوجۆر؛ جیاجیا.

**variegation** (vâr′i-ə-gā′shən), *n.* (١) هەمەڕەنگ کردن؛ هەمەجۆرکران (٢) هەمەڕەنگی؛ ڕەنگ جۆراوجۆری.

**varietal** (və-rī′ə-t′l), *adj.* جۆری؛ چەشنی؛ تایبەتی بە جۆرە زیندەوەرێك یا تۆخمێك *( ~ name)* .

**variety** (və-rī′ə-ti), *n.* (١) جۆراوجۆری؛ هەمەجۆری؛ جیاوازی.
(٢) کۆمەڵی جۆراوجۆر یا جیاواز؛ جۆرەها:
*( There is a ~ of items in the shop.)*
(٣) جۆر؛ بابەت؛ چەشن: *( a ~ of grapes, tomatoes, pigeons, etc.)*
(٤) تۆخمی زیندەوەر؛ جۆر.
(٥) [British] variety show .

**variety show,** ئاهەنگی جۆراوجۆر (کە سەماو گۆرانی و شانۆنامەی کورت و پێکەنیناوی و ... هتد تێدایە).

**variform** (vâr′ə-fôrm′), *adj.* هەمەشێوە.

**variola** (və-rī′ə-lə), *n.* = smallpox.

**variolar** (və-rī′ə-lẽr), *adj.* = variolous.

**variolate** (vâr′i-ə-lāt′), *adj.* کونج؛ کونج کونج؛ ئاوڵاوی؛ ئاوڵەدار.
*v.t.* ئاوڵە کوتان

**variole** (vâr′i-ōl′), *n.* کونجی؛ کونج؛ نیشانەی وەك ئاوڵە

**variolite** (vâr′i-ə-līt′), *n.* بەردێکی ئاگرپڕژێنی کونج کونجە.

**varioloid** (vâr′i-ə-loid′), *adj.* لە ئاوڵە دەچێت؛ ئاوڵەیی.
*n.* ئاوڵەیەکی سووکە تووشی ئەوانە دەبێت کە دەکوترێن بۆ ئاوڵە یا لەوەوپێش ئاوڵەیان گرتووە.

**variolous** (və-rī′ə-ləs), *adj.* (١) (ا) ئاوڵاوی (ب) تایبەتی بە ئاوڵە.
(٢) کونج؛ کونج کونج.

**variometer** (vâr′i-om′ə-tẽr), *n.* پێوەرو بەراووردکەری هێزی موگناتیسی لە شوێنی جۆراوجۆری سەرزەمین.

**variorum** (vâr′i-ôr′əm, vā′ri-ō′rəm), *n.* (١) بەرگی کتێبێك یا دەقی بەرهەمی نووسەرێکی کلاسیکی بە تێبینی چەند ڕەخنەگرو زانایەکەوە.
(٢) بەرگی چەند دەقێکی جیاوازی بەرهەمی نووسەرێکی کلاسیکی.
*adj.* تایبەتی بە بەرگی کتێبێك یا بەرهەمێکی وەها:
*( The ~ edition of Shakespeare)*

**various** (vâr′i-əs), *adj.* (١) (ا) جیا جیا؛ جیاواز.
(ب) جۆراو جۆر؛ هەمەجۆر.
(٢) گەلێك؛ چەندەها؛ زۆر: *( ~ sections of the country)* .
(٣) فرە بەهرە؛ فرە توانا.
(٤) هەمەڕەنگ: ڕەنگاوڕەنگ: *( birds of ~ plumage)* .
(٥) هەموو بە جیا جیا؛ یەکە یەکە: *( ~ club members)* .
(٦) [Archaic]، بگۆڕ؛ هەمیشە گۆڕپاو.

-variously *(adv.)*; variousness *(n.)*.

**varix** (vâr′iks), *n.* (١) بۆری خوێنی فراوان بوو یا کشاوو پێچ خواردوو (بەتایبەتی خوێنهێنەر). (پێشی دەوترێ: " varicose vein ").
(٢) هێڵی پەراسوویی قاوغی قاقلەجنۆکە.

**varlet** (vär′lit), *n.* [Archaic], (١) بەردەست؛ نۆکەر.
(٢) بەردەستی سوارچاك. (٣) کەسێکی زۆڵو ناپاك؛ بەدکار.

**varletry** (vär′lit-ri), *n.* [Archaic], (١) نۆکەران؛ چینی نۆکەران.
(٢) جەماوەری ڕووتەو پووتەی سەرکێش و ناشووبگێر.

**varmint, varment** (vär′mənt), *n.* [Dial. or Colloq.]. (١)– جانەوەری زیانبەخش. (٢) مرۆڤی پیس و بۆگەن.

**varnish** (vär′nish), *n.* (١) وارنیش بۆیەی ساف و لووس کردنی تەختەو کانزا؛ بۆیەی ڕووکەشی کردن. (٢) بریسکەی ڕووی ساف و لووس کراو.
(٣) ڕووکەش؛ ڕواڵەت.
*v.t.* (١) (ا) وارنیش لێدان؛ وارنیش تێهەڵسوون. (ب) ساف و لووس کردن؛ بریسکاندنەوە؛ بریقاندنەوە. (٢) ڕووکەش کردن؛ جوان کردن؛ ڕازاندنەوە

**varnish tree,** داری وارنیش: درەختێکە لە ئاورگەکەی وارنیش دروست دەکرێت.

**varsity** (vär′sə-ti), *n.* (١) تیپی وەرزشی نوێنەری زانکۆ یا قوتابخانەیەك. (٢) [British Colloq.]، زانکۆ؛ زانستگا.
*adj.* تایبەتی بە تیپی وەرزش و پێشبڕکێی زانکۆو قوتابخانە.

**varous** (vâr′əs), *n.* چەمانەوەی لاق.

**vary** (vâr′i), *v.t.* (١) گۆڕین.
(٢) جیاوازی تێخستن؛ گۆڕین؛ هەمەجۆرکردن:
*( The doctor told him to ~ his diet.)*
*v.i.* (١) گۆڕان؛ گۆڕان بەسەردا هاتن: *( a ~ing society)* .
(٢) جیاواز بوون لە: *( Prices ~ from one shop to another.)*
(٣) ( ~ from )، لادان لە تۆخمی خۆ؛ جیاوازی پیشاندان لەگەڵ تۆخمی خۆدا.
(٤) هەمەجۆر بوون.
(٥) نرخ گۆڕان بە ڕاستەوانەیی یا پێچەوانە بە هەمان ڕادە (بیرکاری).

**vas** (vas), *n.* بۆری لەش.

**vascular** (vas′kyoo-lẽr), *adj.* (١) (ا) هی بۆری خوێن یا لەمف.
(ب) هی جۆری ئاووگ (ڕووەکناسی).
(٢) چالاك؛ چوست و چالاك؛ بەتین.

**vascular tissue,** شانەی بۆری ئاووگ لە ڕووەکدا.

**vasculum** (vas′kyoo-ləm), *n.* سنووقێکی کانزاییە بۆ نموونەی ڕووەك تێدا کۆکردنەوە.

**vas deferens,** بۆری تۆماو (لە گونەوە بۆ کێر).

**vase** (vās, vāz), *n.* گوڵدان.

**vasectomy** (vas-ek′tə-mi), *n.* دەرهێنان یا بڕینی بۆری تۆماو (نەشتەرگەری).

**vaselin** (vas′ə-lēn′, vas′′l-in), *n.* ڤازلین: مەڵحەمێکە بۆ چەورکردن.

**vaso-** (vas′ō, vas′ə), *Also* vas, پێشگرێکە بەمانای: (١) بۆری خوێن *( vasomotor)*
(٢) بۆری تۆماو: vas deferens .
(٣) vasomotor

**vasoconstriction** (vas′ō-kən-strik′shən), *n.* کرژبوونی بۆری خوێن.

**vasoconstrictor** (vas′ō-kən-strik′tẽr), *n.* بۆری خوێن کرژکەر (هەستەدەمار، دەرمان).

**vasodilation** (vas′ō-dī-lā′shən), *n.* فراوان بوون یا کشانی بۆری خوێن.

**vasodilator** (vas′ō-dī-lā′tẽr, vas′ō-di-lā′tẽr), *n.* بۆری خوێن فراوانکەر (هەستەدەمار، دەرمان).

**vasomotor** (vas′ō-mō′tẽr), *n.* ڕێکخەری کرژبوون و فراوان بوونی بۆری خوێن (هەستەدەمار، دەرمان).

**vassal** (vas′′l), *n.* (١) مسکێن؛ جووتیارێکە زەوی بە کرێ دەگرێ لە دەرەبەگ. (٢) ژێردەستە؛ خواردەستە.
(٣) (ا) بەردەست؛ نۆکەر. (ب) کۆیلە؛ بەندە؛ بەند.
*adj.* (١) مسکێنی. (٢) چاوشۆڕ؛ سەرشۆڕ؛ ژێردەستە.

**vassalage** (vas′′l-ij), *n.* (١) مسکێنێتی؛ مسکێنی.
(٢) ئەو ئیش و کارو خزمەتەی کە لەسەر مسکێنە بۆ دەرەبەگی بکات.
(٣) بەردەستی؛ ژێردەستی؛ بەندەگی.
(٤) ئەو زەوی‌وزارەی دەرەبەگە کە بەدەست جووتیارەوەیە بە کرێ.
(٥) مسکێن بە گشتی؛ دەستەی جووتیارانی دەرەبەگ.

**vast** (vast, väst), *adj.* (١) زل؛ گەورە؛ مەزن. (٢) فراوان؛ گەورە.
(٣) زۆر (ژمارە، هەند)؛ فرە: *( a ~ number of them)* .
(٤) زۆر (ڕادە، پلە)؛ ئێجگار زۆر: *( ~ knowledge)* .

**n.** [Poetic], شوێنێکی گەورە یا فراوان.
-vastly *(adv.)*; vastness *(n.)*.
**vastitude** (vas′tə-tōōd′, väs′tə-tūd′), **n.** *Also* vastity, -(١) گەورەیی؛ زل؛ فراوانی؛ مەزنی. (٢) جێیەکی زۆر گەورەو فراوان.
**vasty** (vas′ti, väs′ti), *adj.* [Archaic], = vast.
**vat** (vat), **n.** (١) تەشتێکی گەورە یا بەرمیلێکە بۆ کانزا شۆردنەوەو خوم گرتنەوەو شەراب گرتنەوەو پێستە خۆش کردن بەکاردێت. (٢) خوم.
*v.t.* (١) لە تەشت یا بەرمیلێکی وەها هەڵکێشان.
(٢) خوم کردن؛ لە خوم هەڵکێشان.
**vatic** (vat′ik), *adj. Also* vatical, پێغەمبەری؛ تایبەتی بە پێغەمبەر.
**Vatican** (vat′i-kən), **n.** ڤاتیکان (أ) نشینگای پاپا لە شاری " ڤاتیکان " لە ڕۆما (ب) ڕژێم یا فەرمانڕەوایی پاپا.
**vaticinal** (və-tis′ə-n'l), *adj.* هی پێشبینی
**vaticinate** (və-tis′ə-nāt′), *v.t. & v.i.* پێش بینین؛ پێشبینی کردن؛ نوقلانەلێدان
-vaticinator *(n.)*.
**vaticination** (vat′ə-si-nā′shən), **n.** (١) پێشبینی؛ نوقلانە.
(٢) پێش بینین؛ پێشبینی کردن؛ نوقلانەلێدان.
**vaudeville** (vōd′vil, vô′də-vil), **n.** (١) خۆنوواندنێکی هەمەچەشنی سەر شانۆیە (کە سەماو گۆرانیو شانۆگەری کورتی تێدایە).
(٢) [Rare]. شانۆگەرییەکی پێکەنیناوییە ناوبەناو بە گۆرانیو سەماوە.
(٣) [Obs.]. گۆرانییەکی لاقرتێیە (لە بابەت باسێکی هاوچەرخەوە).
-vaudevillian *(n.)*.
**vault** (vôlt), **n.** (١) تاق (٢) گوومەز (٣) ژێرزەمین؛ سارداو.
(٤) گۆڕستانی ژێر زەمین.
(٥) قاسە؛ قاسەخانەی بانق؛ گەنجینەی پارەو شتی بەنرخی تری بانق.
(٦) ئەشکەوتێکی ژێرزەمینی بنمیچ وەك تاق. (٧) ئاسمان.
(٨) کاسەی سەر.
*v.t.* (١) تاق بەسەردا دروستکردن (٢) وەك تاق دروستکردن.
*v.i.* وەك تاق چەمینەوە
**vault** (vôlt), *v.i.* بازدان؛ قەلەمبازدان؛ خۆهەڵدان.
*v.t.* (١) بازد بەسەردا دان. *( He ~ed the fence.)*.
(٢) خۆهەڵدانە سەر پشتی ئەسپ
**n.** (١) بازد؛ بازدان؛ خۆهەڵدان. (٢) بازدی ئەسپ.
**vaulted** (vôl′tid), *adj.* (١) لە تاق دەچێت
(٢) سەربانەکەی وەك تاق یا گوومەزە.
**vaulter** (vôl′tēr), **n.** بازدەر (بەتایبەتی بە دار لە بۆڕبۆڕێنی بازدی بەرزدا)
**vaulting** (vôl′tiŋ), **n.** (١) تاقکاری؛ تاق دروستکردن
(٢) کەوانەی تاق (٣) تاق بەگشتی
**vaulting** (vôl′tiŋ), *adj.* (١) بازدەر؛ بازد بەسەردا دەر.
(٢) لە ڕادە بەدەر؛ نێجگار زۆر: *( ~ ambition)*.
(٣) لە بازداندا بەکاردەهێنرێت؛ هی بازدان. *( a ~ pole)*.
**vaulting horse,** کەری جیمناستیك
**vaunt** (vônt, vänt), *v.i.* خۆهەڵکێشان؛ فشەکردن.
*v.t.* خۆ پێوە هەڵکێشان؛ شانازی پێوەکردن؛ پێوە نازین
**n.** خۆهەڵکێشان؛ شانازی؛ فشە؛ فیشاڵ.
-vaunter *(n.)*; vaunteringly *(adv.)*.
**vaunt-courier** (vänt′koor′i-ēr), **n.** (١) [Obs.]. سەربازی پێشەنگ؛ سەربازێکە لەپێش لەشکرەوە دەنێررێت. (٢) پێشڕەو؛ پێشەنگ؛ مژدەبەر؛ ڕێ خۆشکەرە.
**vavasor** (vav′ə-sôr′), **n.** *Also* vavasour, سەرکاری دەرەبەگ
**V-Day** (vē′dā′), **n.** = Victory Day. ڕۆژی سەرکەوتن
**veal** (vēl), **n.** (١) گۆشتی گوێرەکە.
(٢) [Now Rare]. گوێرەکەی سەربڕین؛ گوێرەکەی بەخێوکراو بۆ گۆشت.
(پێشی دەوورترێ: " vealer ").
**vection** (vek′shən), **n.** نەخۆشی گرتن لە کەسێکی ترەوە.
**vector** (vek′tēr), **n.** (١) ژمارەی ئاراستەیی (بەتایبەتی کە جێی دوور شت پیشان بدات لە هەوادا) (بیرکاری). (٢) ڕێڕەوی فڕۆکەو مووشەك
(٣) هێزی پاڵنەر.
(٤) مێرووی میکرۆب هەڵگر؛ جانەوەری میکرۆب گوێزەرەوە.
-vectorial *(adj.)*.
**Veda** (vā′də, vē′də), **n.** ڤیدا: کتێبی ئاینی هیندی (یەکێکیان یا هەر چواریان).
**Vedanta** (vi-dän′tə, vi-dan′tə), **n.** ڤیدانتا: فەلسەفەی هیندی (لەسەر کتێبی " ڤیدا " دانراوە).
**V-E Day** (vē′ē′), = Victory-in-Europe Day. ڕۆژی سەرکەوتن لە ئەورووپادا (بەسەر نازییەکاندا لە شەڕی جیهانی دووەمدا کە ڕێکەوتی ١٩٤٤/٥/٨ ە).
**Vedda, Veddah** (ved′ə), **n.** ڤیددا: یەکێکە لە خەڵکە بنەڕەتییەکانی سیلان.
**vedette** (vi-det′), **n.** *Also* vidette, (١) پاسەوانی دیدەوانی سوارەی لەشکر؛ پاساوڵی سوارەی سوپا. (٢) بەلەمی پاسەوان؛ بەلەمی دیدەوان (هەروەها " vedette boat ").
**Vedic** (vā′dik, vē′dik), *adj.* ڤیدایی؛ تایبەتی بە ڤیدا.
**n.** ڤیدیك: ئەو زمانەیە کە " ڤیدا " ی پێ نووسراوە (کە بریتییە لە " سانسکریت " ی کۆن). (پێنجەم ووشەی پێشوو ببینە).
**vee** (vē), **n.** (١) تیپی " V ". (٢) [Colloq.]، پێنج دۆلاری.
*adj.* لە " V " دەچێت.
**veep** (vēp), **n.** [Slang], = vice president.
**veer** (vêr), *v.i.* (١) لادان؛ لە ڕێ لادان: *( to ~ to the right)*.
(٢) هەڵوێست گۆڕین؛ ڕێباز گۆڕین.
(٣) ڕوو یا ڕێڕەو گۆڕین (با)؛ بەرەو لایەکی تر هەڵکردن.
(٤) لادانی کەشتی؛ ڕوو یا ڕێڕەوی کەشتی گۆڕین.
*v.t.* (١) لادان؛ ڕێ یا ڕێڕەو گۆڕین. (٢) کەشتی لادان؛ ڕووی کەشتی گۆڕین.
**n.** لادان؛ لە ڕێ لادان؛ ڕێڕەو گۆڕین.
**veer** (vêr), *v.t. & v.i.*, ( ~ **out**), شل کردنەوە (پەت، گوریس، زنجیر)؛ درێژکردنەوە.
**veery** (vēr′i), **n.** ڕیشۆڵەی ئەمەریکی.
**vegetable** (vej′tə-b'l, vej′i-tə-b'l), **n.** (١) سەوزە؛ سەوزی.
(٢) ڕووەك؛ گژوگیا (٣) کەسێکە کە مێشکی ئەخاتە کارو ژیانێکی بێ گۆڕینو مردووانە بژی (وەك نەخۆشی کەفتەکار یا کەسێکی مێشك سووك).
*adj.* (١) لە ڕووەك دەرهێنراو؛ ڕووەکی؛ سەوزە: *( ~ oil)*.
(٢) لە توخمی ڕووەك یا سەوزەیە: *( the ~ kingdom)*.
(٣) ووشكو ناخۆشو مردووانە (ژیان): *( to lead a ~ existence)*.
**vegetable kingdom,** جیهانی ڕووەك؛ توخم یا بابەتی ڕووەك؛ ڕووەك بەگشتی.
**vegetable oil,** ڕۆنی ڕووەك؛ ڕۆنی سەوزە.
**vegetable plate,** قاپە سەوزە؛ قاپی خواردەمەنی بێ گۆشت.
**vegetable tallow,** پیوی ڕووەك: چەورییەکە لە هەندێ ڕووەك دەردەهێنرێتو دەکرێت بە سابوونو مۆم.
**vegetable wax,** مێوی ڕووەك: مێوێکە لە هەندێ دارخورما دەردەهێنرێتو مۆمی لێ دروست دەکرێ.
**vegetal** (vej′ə-t'l), *adj.* (١) ڕووەکی؛ گژوگیایی.
(٢) vegetative # 2.
**vegetarian** (vej′ə-târ′i-ən), **n.** سەوزەخۆر (مرۆڤ)؛ گۆشت نەخۆر؛ کەسێکی گۆشت نەخۆر.
*adj.* (١) تایبەتی بە سەوزەخۆر؛ هی گۆشت نەخۆر؛ گۆشت نەخۆر.
(٢) لە سەوزە یا گژوگیا پێکهاتوو؛ بێ گۆشت: *( a ~ diet, meal, etc.)*
**vegetarianism** (vej′ə-târ′i-ən-iz'm), **n.** سەوزەخۆری؛

گۆشت نەخۆری؛ گژوگیا خواردن.

**vegetate** (vej′ə-tāt′), *v.i.* ١. وەکو ڕووەك گەورەبوون.
٢. بەرەسەندن (مێخەکەو برینی تر)
٣. ژیانێکی بۆش‌و بێ مێشك بەکارهێنان‌و تەمەڵانە بردنەسەر؛ هیچ نەکردن:
*( ~ing in a stagnant society; They just sit home and ~ .)*

**vegetation** (vej′ə-tā′shən), *n.* ١. وەك ڕووەك گەورەبوون.
٢. شینایی؛ سەوزایی؛ سەوزی سرووشت؛ گژوگیا؛ ڕووەکی ناوچەیەك بەگشتی. (٣) ژیانی تەمەڵی‌و بیرنەکردنەوەو هیچ نەکردن.
٤. برین: زیادە گۆشت؛ شتێکی ناناسایی لە لەشدا پەیدابوو.

**vegetative** (vej′ə-tā′tiv), *adj.* ١. (ا) ڕووەکی؛ گژوگیایی؛ تایبەتی بە ڕووەك. (ب) تایبەتی بە ڕووەك گەورەبوون.
٢. بەرەسەندوو؛ بۆی هەیە گەورە ببێت.
٣. تایبەتی بە گەورەبوونی ڕووەك نەك بە چاك کردن یا لەیەکدان.
٤. هیچ نەکردوو؛ نەبزواو؛ بزگەن کردوو (لەبەر دانیشتن‌و هیچ نەکردن):
*( a ~ life or existence)*

**vegetive** (vej′ə-tiv), *adj.* = vegetative.

**vehemence** (vē′ə-məns), *n. Also* vehemency. توندوتیژی؛ هێز: توندی؛ تین؛ جۆش *( the ~ of the attack)*.

**vehement** (vē′ə-mənt), *adj.* ١. توندوتیژ؛ توند؛ بەتین:
*( a ~ defence; a ~ denial of the charges)*
٢. بەجۆش: بەسۆز؛ گەرم؛ بەپەرۆش: *( a ~ desire)*.
٣. قایم: *(a ~ wind)*.

-vehemently *(adv.)*.

**vehicle** (vē′ə-k'l), *n.* ١. هۆی هاتوچۆی ڕەوڕەوەدار؛ هۆی گواستنەوەی پێچکەدار؛ مەکینەی پێچکەدار؛ ئوتومبیل.
٢. هۆی ڕاگەیاندن: *( a ~ for ideas, communication, etc.)*.
٣. شلەیەکی شیرینە دەرمانی تێکەڵاو دەکرێت‌و دەدرێت بە نەخۆش.
٤. شلەیەکی وەك ڕۆن یا ئاو ڕەنگی تێدا دەگیرێتەوە بۆ نیگارکێشان.

**vehicular** (vē-hik′yoo-lēr), *adj.* ١. بۆ ئوتومبیل کراو
*( a ~ tunnel)*
٢. بە ئوتومبیل کراو: *( ~ manslaughter)*.
٣. بیر ڕاگەیەنەر

**veil** (vāl), *n.* ١. پەچە: ڕووپۆش؛ تارا.
٢. پەردە (٣) پەردە (مەجاز): *( a ~ of mist; a ~ of silence)*.
٤. [Dial.] caul. (٥) velum
٦. سەرپۆشی پەرستار

*v.t.* ١. پەچەگرتنەوە. (٢) داپۆشین؛ شاردنەوە

take the veil, بوون بە پەرستار

**veiled** (vāld), *adj.* ١. ڕووپۆش: پەچە بەسەر؛ پەچە دەگرێتەوە.
٢. شاراوە؛ داپۆشراو؛ پەردەدار؛ ناڕاستەوخۆ: *( a ~ threat)*.

**veiling** (vāl′iŋ), *n.* ١. ڕووپۆشین؛ پەچەگرتنەوە؛ داپۆشین
٢. پەچە: ڕووپۆش؛ پەردە. (٢) قوماشی تەنکی پەچە.

**vein** (vān), *n.* ١. (ا) خوێنهێنەر. (ب) دەماری خوێن؛ بۆری خوێن؛ دەزوولەی خوێن (٢) پەراسوو یا دەماری باڵی جانەوەر.
٣. دەماری گەڵا (٤) دەماری مەڕمەڕ یا دار (٥) دەمارە کانزا.
٦. ڕەگ؛ دەمار؛ نیشانەی تایبەخۆ:
*( There was a ~ of humor in his essay.)*
٧. باری سەردەمی هەست‌و مێشك: *( Let me speak in a serious ~ .)*.

*v.t.* ١. هێڵ پێداهێنان؛ نیشانەکردن بە هێڵ (٢) تەرز فڕێدان.

**veined** (vānd), *adj.* ڕەگاوی (وەك مەڕمەڕ)؛ دەماراوی.

**veining** (vān′iŋ), *n.* نەخشەی دەمار (گەڵا، باڵی جانەوەر)

**veinlet** (vān′lit), *n.* دەمارە باریکە یا بچکۆلە (گەڵا، باڵی جانەوەر)

**veinstone** (vān′stōn′), *n.* gangue.

**veiny** (vān′i), *adj.* دەماراوی (مەڕمەڕ)؛ دەماردار *( a ~ hand)*.

**vela** (vē′lə), *plural of* velum.

**velamen** (və-lā′mən), *n.* پەردە (گیانەوەرناسی، ڕووەکناسی).

**velar** (vē′lēr), *adj.* (١) (ا) پەردەیی. (ب) تایبەتی بە ئاسمانەی نەرمی دەم یا مەڵاشوو. (٢) تایبەتی بە دەنگێك کە لە لەیەکدانی پشتەوەی زمان‌و مەڵاشوو پەیدادەبێت (وەك " g " و " k " لە وشەکانی " good " و " cup " دا). (دەنگناسی)

*n.* دەنگێکی وەها. (هەروەها پێشی دەوترێ: " guttural ").

**velarium** (və-lâr′i-əm), *n.* چەتری گەورەی سەر شانۆ یا یاریگای ڕۆمای کۆن

**velarize** (vē′lēr-īz′), *v.t.* بێژانی دەنگێك بە پشتی زمان‌و لە مەڵاشوو دان (دەنگناسی).

**velate** (vē′lāt, vē′lit), *adj.* پەردەدار (زیندەوەرزانی).

**veld, veldt** (velt, felt), *n.* لەوەڕگای بێ دارو درەخت؛ دەشتی گژوگیاوی.

**veliation** (və-lī′ə-shən), *n.* (١) بەیەکداکێشان؛ بەیەکداهاتن.
(٢) ناکۆکی؛ ناڕێکی.

**velleity** (və-lē′ə-ti), *n.* (١) ئارەزووی کەم یا سارد.
(٢) ئارەزوویەکە کە کرداری لەگەڵ نەبێ

**vellicate** (vel′ə-kāt′), *v.t.* ڕاتەکاندن؛ ڕاکێشان؛ قرتاندن؛ نقورچ لێگرتن؛ لێکردنەوە.

*v.i.* فڕین (ماسولکەی دەم‌وچاو... هتد)

-vellication *(n.)*.

**vellum** (vel′əm), *n.* (١) پێستەی تەنك بۆ نووسین یا بەرگی کتێب؛ کاغەزی پێستە. (٢) دەستنووسێکی لەسەر پێستە نووسراو
(٣) کاغەزی پێستەیی

*adj.* وەك پێستەی نووسین یا بەرگ تێگرتن؛ پێستەیی.

**veloce** (və-los′), *adv.* خێرا (فەرمانی سەرتیپی مۆسیقا).

**velocipede** (və-los′ə-pēd′), *n.* (١) پاسکیل.
(٢) پاسکیلی سێ پێچکەی منداڵان.
(٣) گالیسکەیەکی دەستی سەر هێڵی ئاسنە.

**velocity** (və-los′ə-ti), *n.* (١) خێرایی (دەنگ، ڕووناکی، با)؛ تیژڕەوی: *( the ~ of sound, the wind, etc.)*.
(٢) خێرایی (ڕوودان). *( the ~ of historical change)*
(٣) دووری بڕاو لە ماوەیەکی تایبەتیدا

**velours, velour** (və-loor′), *n.* ڤیلوور: جۆرێکە لە قەیفە یا مەخمەڵ.

**velum** (vē′ləm), *n.* (١) پەردە (زیندەوەرزانی). (٢) soft palate.

**velure** (və-loor′), *n.* [Obs.], ڤیلوور: جۆرێکە لە قەیفە یا مەخمەڵ. (هەروەها " velours ").

**velutinous** (və-lōō′t'n-əs), *adj.* قەیفەیی (زیندەوەرزانی)؛ مەخمەڵی؛ بە گەندەموو داپۆشراو.

**velvet** (vel′vit), *n.* (١) قەیفە؛ مەخمەڵ. (٢) شتێکی ڕوو قەیفەیی.
(٣) نەرمی. (٤) تووکی نەرمی شاخی تازەی ئاسك.
(٥) [Slang]، قازانج؛ دەسکەوتی ئاسان.

*adj.* (١) قەیفەیی؛ مەخمەڵی؛ قەیفە. (٢) نەرم؛ نەرم‌ونۆڵ؛ لووس

**velveteen** (vel′və-tēn′), *n.* (١) قوماشی لۆکەی قەیفەیی؛ قوماشی قەیفەیی (٢) (*pl.*)، جلی لەم قوماشە دروستکراو (بەتایبەتی پانتۆڵ).

**velvety** (vel′vi-ti), *adj.* (١) قەیفەیی؛ مەخمەڵی؛ نەرم؛ نەرم‌ونۆڵ.
(٢) خۆش (تام)؛ تیژو تاڵ نییە.

**vena** (vē′nə), *n.* [L.], *pl.* venae, = vein.

**vena cava,** خوێنبەری بۆش: یەکێکە لەو دوو بۆرییە گەورەیەی خوێن دەبات بۆ دڵ

**venal** (vē′n'l), *adj.* (١) (ا) بەرتیل خۆر *( a ~ judge)*. (ب) خۆفرۆش (٢) بە پارە دەکڕێت یا دەست دەکەوێت؛ بە پارەیە؛ بە پارە دەکڕێت نەك بە لێهاتوویی: *( ~ acquitals; ~ services)*

**with a view to,** (١) بەو نیازەی؛ بە نیازی؛ بەو مەبەستەی
(٢) بەو هیو یەی کە؛ بەهیوای

**viewer** (vū′ēr), *n.* (١) (أ) بینەر؛ سەیرکەر.
(ب) بینەر یـ سەیرکەری تەلەفزیۆن. (٢) ئامێری بینین.

**view-finder,** = finder # 2.

**viewless** (vū′lis), *adj.* (١) نەبینراو. (٢) بێ را؛ بێ هەڵوێست.

**viewpoint** (vū′point′), *n.* (١) باری سەرنج؛ گۆشەی سەرنج.
(٢) را؛ هەڵوێست؛ دەمودوو. (هەروەها " point of view ").

**viewy** (vū′i), *adj.* [Colloq.], (١) خەیاڵ پەرست؛ بیروڕای سەیری
هەیە. (٢) ڕازاوە؛ زەق؛ سەرنج ڕاکێش؛ بریقاوە.

**vigesimal** (vī-jes′ə-m′l), *adj.* (١) بیستەم
(٢) بیستی؛ لەسەر ژمارەی بیست دانراو
(٣) بیست بیستی: *( ~ counting)*.

**vigil** (vij′əl), *n.* (١) ئێشك؛ ئێشكگرتن؛ شەونخونی؛ چاودێری: *( to keep ~ over a sick child)*
(٢) (أ) شەوی جەژن؛ ئێوارەی جەژن (بەتایبەتی کە بە نوێژو نزاوە بربێتە سەر).
(ب) ئێشكی ئێوارەی جەژن. (ج) *(pl.)* نوێژی شەوی جەژن.

**vigilance** (vij′ə-ləns), *n.* وریایی؛ ئاگاداری؛ هۆشیاری.

**vigilance committee,** (١) لیژنەی پاسەوانی سەربەخۆ: لیژنەیەكی
میللیەیە بۆ پاسەوانی گەرەك و ڕاگرتنی ئاسایش و سزادانی تاوانكاران
(بەتایبەتی لەكاتی پشێوی و پاشاگەردانیدا). (٢) تاقمی تۆقاندنی قولەڕەش و
لایەنگرە سپییەكانیان لە خواروی ئەمەریكا لەسەردەمی شەڕی ناوخۆی
ئەمەریكادا

**vigilant** (vij′ə-lənt), *adj.* وریا؛ ئاگادار؛ هۆشیار

**vigilante** (vij′ə-lan′ti), *n.* ئەندامی لیژنەی پاسەوانی سەربەخۆ
(ووشەی پێشووتر ببینە)؛ پاسەوانی سەربەخۆ.

**vigilantism** (vij′ə-lan′ti-z′m), *n.* پاسەوانی سەربەخۆ؛
یاسا گرتنەدەست خۆ لەلایەن لیژنەی پاسەوانی سەربەخۆوە (سێهەم ووشەی
پێشوو ببینە).

**vignette** (vin-yet′), *n.* (١) نەخشی سەرەتا و كۆتایی و قەراغی لاپەڕە
(٢) وێنەی سەروشان.
(٣) بەرهەمێكی وێژەیی یا شانۆیی كورت و جوان داڕێژراو.

*v.t.* وێنەی سنوور دیاری نەكراو كردن.

**vigor, vigour** (vig′ēr), *n.* (١) چوست و چالاكی؛ چالاكی؛ گوڕ؛ توانا؛
هێز؛ وورە؛ تین (٢) تاف.
(٣) توانای گەورەبوون یا پەرەسەندن: *( the ~ of a plant)*.
(٤) توندی؛ توندوتیژی؛ تین: *( the ~ of her denial)*.
(٥) درووستی (یاسا)؛ بەردەوامی كاریگەری: *( the ~ of the law)*.

**vigorous** (vig′ēr-əs), *adj.* (١) بەهێز؛ بەتین؛ بەووزە.
(٢) چالاك؛ چوست و چالاك؛ گورج و گۆڵ؛ بەگوڕ. (٣) توندوتیژ؛ توند.

-**vigorously** *(adv.)*; **vigorousness** *(n.)*.

**viking, Viking** (vī′kiŋ), *n.* چەتەی دەریای ئەسكەندیناڤی.

**vile** (vīl), *adj.* (١) بەد؛ نامەرد؛ نالەبار؛ ناپەسەند؛ نزم
(٢) پیس؛ بۆگەن (٣) بێ نرخ؛ بێ بایەخ؛ هیچ وپووچ.
(٤) خراپ (بارودۆخ)؛ ناپەسەند؛ پیس: *( ~ weather)*.

-**vilely** *(adv.)*; **vileness** *(n.)*.

**vilification** (vil′ə-fi-kā′shən), *n.* (١) ناو پیس كردن؛
سووك كردن؛ بەدگۆیی كردن؛ قسەی خراپ پێ وتن؛ لەكەداركردن.
(٢) جوێن؛ بەدگۆیی؛ قسەی سووك.

**vilify** (vil′ə-fī′), *v.t.* ناو پیس كردن؛ سووك كردن؛ بەدگۆیی كردن؛
قسەی سووك پێ وتن؛ ناوزڕاندن.

-**vilifier** *(n.)*.

**vilipend** (vil′ə-pend′), *v.t.* (١) بە سووك سەیركردن؛ گاڵتەپێكردن.
(٢) ناو پیس كردن؛ قسەی خراپ پێ وتن.

**villa** (vil′ə), *n.* ڤێلا: كۆشكی لادێ یا قەراغ شار؛ خانووی زۆر خۆش

**villadom** (vil′ə-dəm), *n.* [Chiefly British], كۆشك و خاوەن
كۆشكان؛ كۆمەڵی خواپێداران؛ جیهانی خاوەن كۆشكان.

**village** (vil′ij), *n.* (١) دێ؛ گوند؛ ئاوایی.
(٢) دێهاتی؛ خەڵكی دێ؛ لادێیی.

*adj.* لادێیی؛ تایبەتی بە لادێ.

**villager** (vil′ij-ēr), *n.* لادێیی؛ دێهاتی؛ دێ نشین.

**villain** (vil′ən), *n.* (١) ناكەس؛ پیاوخراپ؛ كەسێكی بەدكارو بەدڕەفتار؛
سێبەندی. (٢) كەسێكی ناكەس لە چیرۆك و شانۆنامەدا.
(٣) villein. (٤) [Obs.]، كەسێكی كەرتڕو هیچ نەزان.

**villainess** (vil′ən-is), *n.* (١) ئافرەتی ناكەس و بەدكار
(٢) ئافرەتی وەها لە چیرۆك و شانۆنامەدا.

**villainous** (vil′ən-əs), *adj.* (١) ناكەس؛ تاوانكار؛ نامەرد؛ ناپیاو.
(٢) ناپەسەند؛ پیس.

**villainy** (vil′ən-i), *n.* (١) ناكەس؛ پیاوخراپی؛ ناپیاوی؛ بەدڕەفتاری؛
سێبەندێتی. (٢) كردەوەی ناكەسانە؛ ڕەووشتی سێبەندییانە. (٣) تاوان
(٤) [Obs.]، villeinage

**villanella** (vil′ə-nel′ə), *n.* ڤیلانێلا: گۆرانییەكی لادێیی ئیتاڵییە
بە سەماوە.

**villanelle** (vil′ə-nel′), *n.* هەڵبەستێكی نۆزدە دێڕییە.

**villatic** (vi-lat′ik), *adj.* دێهاتی؛ لادێی.

**villein** (vil′ən), *n.* جووتیاری نیمچە ئازاد (لە ڕژێمی دەرەبەگی
ئینگلیزی كۆندا).

**villeinage, villenage, villanage** (vil′ən-ij), *n.* جووتیاری
نیمچە ئازاد (ووشەی پێشوو ببینە).

**villiform** (vil′ə-fôrm′), *adj.* وەك گەندەموو.

**villosity** (vi-los′ə-ti), *n.* (١) گەندەمووا وێتی؛ گەندەتووكاوێتی؛
مەمیلەدارێتی. (٢) ڕووەكی گەندەموودار (وەك قەیفە). (٣) villus

**villous** (vil′əs), *adj. Also* **villose,** (١) گەندەمووا وی؛ بە گەندەتووك
داپۆشراو. (٢) وەك گەندەموو.

**villus** (vil′əs), *n.pl.* **villi,** گەندەموو (توێكاری، ڕووەكناسی)؛
گەندەتووك.

**vim** (vim), *n.* تین؛ ووزە؛ هێز؛ توانا.

**vimen** (vī′men), *n.* خەڵف؛ چڵ؛ تووڵ.

-**viminal** *(adj.)*.

**vimineous** (vi-min′i-əs), *adj.* (١) بە تووڵ چنراو؛ لە تووڵ یا
شووڵ پێكهاتوو. (٢) خەڵفی درێژی دەركردووە (ڕووەكزانی)؛ تووڵدار.

**vina** (vē′nä), *n.* ڤینە: ئامێرێكی مۆسیقی ژێداری هیندییە.

**vinaceous** (vī-nā′shəs), *adj.* (١) شەرابی؛ ترێیی؛ لە شەراب یا
ترێ دەچێ. (٢) ڕەنگ شەرابی؛ سوور.

**vinaigrette** (vin′i-gret′), *n.* (١) شووشەی بۆن: دەفرێكی سەر
كون كونە بۆنی خۆشی تێ دەكرێت. (٢) vinaigrette sauce.

**vinaigrette sauce,** خۆشاوی سركە: خۆشاوێكی زەڵاتەیە لە سركە و
شەراب و پیازی جنراو و گیای بۆن خۆش پێكدێت.

**Vincent's angina ( or infection ),** = trench mouth.

**vincible** (vin′sə-b′l), *adj.* دەبەزێنرێت؛ دەتوانرێت ببەزێنرێت.

-**vincibility** *(n.)*.

**vinculum** (viŋ′kyoo-ləm), *n.* (١) بەند؛ پێبەست؛ پەیوەند؛
پەیوەندی. (٢) بەند (توێكاری)؛ ڕیشاڵی جیڕی نێوان دوو جومگە؛ پەردە یا
ڕیشاڵی دوو ئەندام لێكدەر. (ووشەی " ligament "و " frenum " ببینە).
(٣) هێڵی سەر چەند ژمارەیەكە بۆ سەیر كردنیان وەك یەك ژمارە: ( $a\text{-}\overline{x+y}$ ).

**vindicate** (vin′də-kāt′), *v.t.* (١) بێ گوناهی دەرخستن؛ بەخشین؛
ئازادكردن. (٢) لایەنگیری كردن؛ لەسەركردنەوە؛ پشتیوانی كردن.
(٣) بە ڕەوا بینین؛ پەڕاندنەوە (مەجاز)؛ بەڵگە بۆ هێنانەوە:
*( His success ~ed their belief in him.)*
(٤) ماف چەسپاندن؛ بە مافی خۆ دانان.

(٥) [Obs.]، (١) تۆڵەسەندن؛ تۆڵە لێکردنەوە. (ب) سزادان.
-vindicator *(n.)*.
**vindication** (vin´də-kā′shən), ***n.*** (١) بەخشین؛ ڕووسپێتی؛
ئازادکران؛ بێ گوناهی دەرخران؛ پەراندنەوە. (٢) بەڵگەی بە ڕەوا بینین؛
بەڵگەی پەراندنەوە یا بێ گوناهی سەلماندن.
**vindicatory** (vin′di-kə-tôr′i, vin′di-kə-tō′ri), ***adj.*** (١)-
پەرێنەرەوە؛ بێ تاوانکەر؛ بێ گوناهی دەرخەر؛ لایەنگر؛ بە ڕەوا بینین.
(٢) سزایی؛ تۆڵەیی؛ لە ڕووی سزا یا تۆڵەوە کراو.
**vindictive** (vin-dik′tiv), ***adj.*** (١) قیناوی؛ قین هەڵگر؛ ڕق لەبەر؛
کینە لە دڵ؛ قین لە سك؛ بە قین: ***(a ~ person)***.
(٢) سزایی؛ تۆڵەیی؛ بۆ سزادان یا تۆڵەسەندنە: ***(~ punishment)***.
-vindictively *(adv.)*; vindictiveness *(n.)*.
**vine** (vīn), ***n.*** (١) ڕووەکی خشۆك یا خۆهەڵواس.
(٢) لاسك و تەرزی ئەم جۆرە ڕووەکە.
(٣) مێو؛ دارمێو.
**vinedresser** (vīn′dres´ēr), ***n.*** مێوبڕ
**vinegar** (vin′i-gēr), ***n.*** (١) سرکە (٢) قسەی ڕەق؛ ڕەووشتی شەڕانی؛
توورەوتروزیی؛ ترش و تاڵی. (٣) vim.
**vinegar eel** ( or **worm** ), کرمی سرکە.
**vinegarette** (vin´ə-gēr-et′), ***n.*** = **vinaigrette.**
**vinegarroon** (vin′i-gə-rōōn´), ***n. Also*** **vinegarone,** جۆرە
دووپشکێکی گەورەی بێ ژەهرە کە وورووژێنرا بۆنێکی وەك سرکەی لێ دەبێتەوە.
**vinegary** (vin′i-gēr-i), ***adj. Also*** **vinegarish,** (١) سرکەیی؛
ترش. (٢) تووڕەوتێژ؛ شەڕانی؛ سەرگەرم.
**vinery** (vīn′ēr-i), ***n.*** (١) شووشەبەندی مێو: خانوویەکی شووشەی
گەرمە مێوی تێدا دەڕوێنرێ و پەروەردە دەکرێ. (٢) مێو؛ دارمێو.
(٣) [Obs.]، **vineyard.**
**vineyard** (vin′yērd), ***n.*** (١) باخە مێو؛ ڕەز
(٢) [Colloq.]، مەودای چالاکی؛ ئەو کارەی کەسێك پێوەی خەریکە.
**vini-** (vin′i), پێشگرێکە بەمانای: ترێی شەراب؛ شەراب:
***(viniculture)***
**vinic** (vī′nik, vin′ik), ***adj.*** شەرابی؛ لە شەرابدایە؛
لە شەراب وەرگیراوە یا دەرهێنراوە.
**viniculture** (vin′i-kul´chēr), ***n.*** ترێی شەراب پەروەردەکردن؛
باخە مێو پەروەردەکردن. (هەروەها " **viticulture** ").
**-vinicultural** ***(adj.)***; **viniculturist** ***(n.)***.
**vinometer** (vin-om′ə-tēr, vī-nom′ə-tēr), ***n.*** پلەی کحول
پێوەر لە شەرابدا.
**vinosity** (vī-nos′ə-ti), ***n.*** (١) شەرابێتی؛ بۆن و ڕەنگ و خەستی
شەراب. (٢) شەراب خۆری؛ خوو بە شەراب خواردنەوە گرتن.
**vinous** (vī′nəs), ***adj.*** (١) شەرابی؛ تایبەت بە شەراب؛ وەك شەرابە.
(٢) (ا) شەراب خۆر. (ب) سەرخۆش؛ ئەنجامی شەراب خواردنەوەیە.
(٣) ڕەنگ شەرابی؛ سوور.
**vintage** (vin′tij), ***n.*** (١) ترێی باخێك یا ناوچەیەك لە ساڵێکی
تایبەتیدا (٢) شەرابی ناوچەو ساڵێکی تایبەتی.
(٣) ناوچە یا ساڵی شەرابێکی تایبەتی.
(٤) ترێ ڕنین و شەراب گرتنەوە؛ وەرزی ترێ ڕنین و شەراب گرتنەوە.
(٥) مۆدێلی کۆن؛ چەشن یا شێوازی کلاسیکی
***adj.*** (١) هەڵبژاردە؛ نایاب: ***(a ~ wine)***.
(٢) کلاسیکی؛ کۆن و نایاب: ***(~ cars, movies, etc.)***.
(٣) کۆن؛ کۆنەباو؛ باونەماو.
(٤) نموونەی چاك: ***(The poem is ~ Bekas.)***.
**vintager** (vin′tij-ēr), ***n.*** ترێ ڕن (بۆ شەراب گرتنەوە)؛ ترێ چن.
**vintage wine,** شەرابی هەڵبژاردەی کۆن؛ شەرابێکە لە ترێی
هەڵبژاردەی ناوچەیەکی تایبەتی دەگیرێتەوەو دادەنرێ هەتا کۆن دەبێت.
**vintage year,** (١) ساڵی شەرابی هەڵبژاردە گرتنەوە؛ ساڵی شەرابی
نایاب. (٢) ساڵی بهات؛ ساڵێکی نایاب.
**vintner** (vint′nēr), ***n.*** (١) شەرابگرەوە؛ شەرابچی.
(٢) شەراب فرۆش (بەتایبەتی کۆفرۆش)؛ بازرگانی شەراب؛ بادەفرۆش.
**viny** (vīn′i), ***adj.*** (١) تەرزی؛ مێوی؛ لە تەرزی خشۆك یا خۆهەڵواس
دەچێ: ***(~ tendrills)***.
(٢) باخە مێوی زۆرە؛ بە ڕووەکی تەرزدار داپۆشراوە: ***(a ~ region)***
**vinyl** (vī′nil, vin′il), ***n.*** (١) ڤاینل (کیمیا).
(٢) ڤاینل: ماددەیەکی پلاستیکییە بۆ شت داپۆشین و بەرگ بەکاردێت.
**viol** (vī′əl), ***n.*** جۆرێکە لە کەمانچە.
**viola** (vi-ō′lə, vī-ō′lə), ***n.*** ڤیۆلا؛ کەمانی گەورە
**viola** (vī′ə-lə, vī-ō′lə), ***n.*** بنەوشە؛ وەنەوشە؛ گوڵە وەنەوشە.
**violable** (vī′ə-lə-b'l), ***adj.*** دەستدرێژی دەکرێتە سەر؛
پەرژینی دەشکێنرێ؛ سنووری دەشکێنرێ.
-violability *(n.)*; violableness *(n.)*; violably *(adv.)*.
**violaceous** (vī´ə-lā′shəs), ***adj.*** (١) بنەوشەیی.
(٢) بنەوشە؛ لە توخمی بنەوشە؛ وەنەوشە.
**viola da braccio,** کەمانی باڵ: کەمانێکی گەورەی کۆنە.
**viola da gamba,** کەمانی لاق: جۆرە کەمانێکی کۆنە لە بەینی هەردوو
ئەژنۆدا دادەنراو لێدەدرا.
**viola d'amore,** کەمانی دڵداری: جۆرە کەمانێکی کۆنە.
**violate** (vī′ə-lāt´), ***v.t.*** (١) (ا) شکاندن (یاسا)؛ سەرپێچی کردن:
***(to ~ the law)***
(ب) پەرژین شکاندن؛ سنوور شکاندن؛ ماف پێشێل کردن؛
پەیمان شکاندن؛ دەستدرێژی کردنە سەر: ***(to ~ someone's rights)***.
(٢) بەزۆر گاین؛ بەزۆر سواربوون؛ نامووس بردن: ***(to ~ a girl)***.
(٣) پیس کردن (جێی پیرۆز)؛ بە سووك یا بەبێ ڕێز تەماشاکردن
(٤) تێکدان؛ شێواندن؛ دەستدرێژی کردنە سەر:
***(to ~ someone's privacy)***
(٥) [Obs.]، بە ناشرینانە لەگەڵ جووڵانەوە.
-violator *(n.)*.
**violation** (vī´ə-lā′shən), ***n.*** (١) (ا) شکاندن (یاسا)؛ سەرپێچی:
***(a ~ of the law)***
(ب) پەرژین شکاندن؛ سنوور شکاندن؛ ماف پێشێل کردن؛ دەستدرێژی.
(٢) بەزۆر گاین یا سواربوون؛ نامووس بردن.
(٣) پیس کردن (مزگەوت، کڵێسە... هتد)؛ بە سووك سەیرکردن.
(٤) تێکدان (ئاسایش... هتد)؛ شێواندن.
**violence** (vī′ə-ləns), ***n.*** (١) توندوتیژی؛ خوێن ڕشتن؛ زۆر؛
زۆر بەکارهێنان؛ ستەمکاری: ***(The essence of war is ~.)***.
(٢) کارێکی توندوتیژ؛ کردەوە یا کاری دڕندانە.
(٣) قایمی؛ توندی؛ تین: ***(the ~ of the storm)***.
(٤) کاری ناڕەوا. (٥) جۆش؛ دڵ گەرمی؛ هەستی بەتین.
(٦) شێواندن (مانا، دەق، ناوەڕۆك)؛ تێکدان: ***(to do ~ to a text)***
**violent** (vī′ə-lənt), ***adj.*** (١) خوێنێن؛ توندوتیژ؛ خوێناوی:
***(a ~ revolution)***
(٢) توندوتیژ: ***(a ~ attack)***.
(٣) ئێجگار؛ زۆر تیژ: ***(~ pains)***.
(٤) قایم؛ توند: ***(a ~ storm)***.
(٥) ناسرووشتی؛ خوێنێن: ***(a ~ death)***.
(٦) شێوێنەر؛ تێکدەر (مانا، دەق، ناوەڕۆك): ***(~ editing)***.
-violently *(adv.)*.
**violet** (vī′ə-lit), ***n.*** (١) وەنەوشە؛ بنەوشە. (٢) گوڵە وەنەوشە.
(٣) ڕەنگی بنەوشەیی؛ مۆر.
***adj.*** بنەوشەیی؛ مۆر؛ بنەوشە.
**violet ray,** (١) تیشکی بنەوشەیی. (٢) تیشکی سەروو بنەوشەیی.

**violin** (vī´ə-lin′), *n.* (١) کەمان؛ کەمانچە. (٢) کەمانچەژەن.
**violinist** (vī´ə-lin′ist), *n.* کەمانژەن؛ کەمانچەژەن.
**violist** (vī′əl-ist), *n.* کەمانی گەورە لێدەر؛ کەمانژەنی گەورە.
**violoncellist** (vē´ə-lon-chel′ist), *n.* = **cellist.**
**violoncello** (vē´ə-lon-chel′ō), *n.* = **cello.**
**V.I.P., VIP,** [Slang], = **very important person,** کەسێکی زۆر گەورە؛ کەسێکی پلەوپایە بەرز.
**viper** (vī′pēr), *n.* (١) کولەوەیباب؛ ماری ژەهراوی؛ ئەژدیها؛ شامار (٢) کەسێکی پیس و ناپاك؛ کەسێکی زمان بەد؛ مرۆڤی ستەمکار.
**viperine** (vī′pēr-in, vī′pēr-īn´), *adj.* کولەوەیبابی؛ ئەژدیهایی؛ ژەهراوی؛ پیس
**viperish** (vī′pēr-ish), *adj.* = **viperous.**
**viperous** (vī′pēr-əs), *adj.* (١) ئەژدیهایی؛ کولەوەیبابی. (٢) پیس، ژەهراوی؛ بەد؛ کیناوی
**virago** (vi-rā′gō, vī-rā′gō), *n.* (١) ژنێکی دەم پیسی بێ حەیای شەڕانی؛ ژنە کوڕانی. (٢) [Archaic]، ژنێکی کەتەو بەهێز.
**viral** (vī′rəl), *adj.* ڤایرۆسی: لە ڤایرۆسەوە داکەوتووە یا تووش بووە (نەخۆشی)؛ تایبەتی بە ڤایرۆس: *( a ~ infection)* .
**virelay** (vir′ə-lā´), *n.* جۆرە هەڵبەستێکی فەرەنسی کۆنە.
**vireo** (vir′i-ō´), *n.* باڵندەیەکی بچووکی دەنگ خۆشی ڕەنگ زەیتوونی مێروو خۆرە
**virescence** (vi-res′'ns), *n.* سەوز هەڵگەڕان (بەتایبەتی پەڕەی گوڵ بەهۆی زۆریی کلۆرفیلەوە).
**virescent** (vi-res′'nt), *adj.* (١) سەوز هەڵگەڕاو (ئەندامێکی ڕووەك کە بە ئاسایی سەوز نییە). (٢) سەوزکار؛ سەوزباو.
**virgate** (vũr′git, vũr′gāt), *n.* پێوانەیەکی ئینگلیزی کۆنی زەوییە بریتییە لە (٣٠) " ئەیکەر " (هەر " ئەیکەر " یێك ٤٠٠٠م دووجایە).
**virgate** (vũr′git, vũr′gāt), *adj.* (١) داردەستی؛ لە داردەست دەچێ (٢) چڵ چڵاوی؛ چڵی بچکۆلەی زۆرە.
**virgin** (vũr′jin), *n.* (١) کچ؛ کەنیشك؛ کچی کون نەکراو. (٢) پیاوی جووت نەبوو. (٣) گیانداری مێینەی جووت نەبوو. (٤) [V-]، virgo . (٥) (ا) پەرستار خاچ پەرستی). (ب) [V-]، حەزرەتی مریەم. (٦) گیانەوەرێکی مێینەیە کە هێلکە دەکات بەبێ ئەوەی نێرەکەی سواری بووبێت یا بەسەریدا تسیبێت.
*adj.* (١) کچی: کەنیشکی؛ کون نەکراو. (٢) لە دەستە کچ پێکهاتوو؛ گەلە کەنیشکی (٣) پاك؛ دەست بەرنەکەوتوو؛ خاوێن. (٤) (ا) نەدۆزراوە؛ بەکارنەهێنراو؛ کەس پیادا نەڕۆیشتوو: *( ~ forest)* . (ب) بەیار، نەکێڵراو؛ هەرگیز نەچێنراو: *( ~ land)* . (٥) یەکەم، سەرەتایی: *( ~ voyage)* . (٦) (ا) هی یەکەم گوشینە (ڕۆنی زەیتوون). *( ~ olive oil)* . (ب) یەکسەر لە کانزای خاوەوە یا لە یەکەم تواندنەوەوە وەرگیراوە (کانزا).
**virginal** (vũr′ji-n'l), *adj.* (١) کچی: کەنیشکی؛ بۆ کچ شیاو؛ لە کەنیشك هاتوو (٢) پاك؛ خاوێن؛ دەست تێوەنەدراو. (٣) چاك نەکراو (گیانەوەرزانی)
**virginal** (vũr′ji-n'l), *n.* ئامێرێکی مۆسیقییە لە پیانۆ دەچێ، بەڵام ئەم بچووکترەو بێ قاچە (پێشی دەوترێ: " **a pair of virginals** ").
**virgin birth,** کەنیشکەزا؛ بازابێز؛ لەدایکبوونی عیسا لە مریەم (ئینجیل).
**virginity** (vēr-jin′ə-ti), *n.* (١) کچێنی، پەردەی کچێنی؛ بێ بنداری (٢) پاکی؛ خاوێنی.
**virginium** (vēr-jin′i-əm), *n.* ڤیرجینیۆم، توخمێکی کانزایی کیمیاییە
**Virgin Mary,** حەزرەتی مریەم؛ کەنیشکە مریەم
**virgin's-bower** (vũr′jinz-bou′ēr), *n.* ڕووەکێکی گوڵ سپییە
**virgin wool,** خوری خاو یا دەست تێوەنەدراو.

**Virgo** (vũr′gō), *n.* (١) ناوی کۆئەستێرەیەکە (٢) بورجی کچ (ئەستێرەناسی). (پێشی دەوترێ: " **Virgin** " بە هەردوو ماناکەی).
**virgulate** (vũr′gyoo-lit, vũr′gyoo-lāt´), *adj.* داردەستی؛ شێوەی داردەستی.
**virgule** (vũr′gūl), *n.* یەرگول: هێڵێکی لارە لە گەلێك شوێندا بەکاردێت وەك: ( **and/or** ) کە ئەوە دەگەیەنێ کە دەشێت دوو ووشەکە هەرکامیان بەکاربهێنرێت لە ڕستەدا، یا بەمانای: " لە " ( **mile/hour** )، یا لە بەرواردا ( **5/9/1993** )، یا لە کۆتایی دێڕی هۆنراوەدا. (پێشی دەوترێ: " **slash** ".
**viridescence** (vir´ə-des′'ns), *n.* سەوز هەڵگەڕان؛ سەوزکاری؛ سەوزباوی.
**viridescent** (vir´ə-des′'nt), *adj.* سەوز هەڵگەڕاو؛ سەوزکار؛ سەوزباو.
**viridian** (və-rid′i-ən), *n.* ڕەنگ یا بۆیەیەکی سەوزە.
**viridity** (və-rid′ə-ti), *n.* (١) سەوزی تۆخ؛ سەوزێتی. (٢) گەنجێتی؛ ساویلکەیی؛ نەشارەزایی.
**virile** (vir′əl), *adj.* (١) پیاوانە؛ پیاو؛ مەرد؛ نێر؛ مەردانە. (٢) بەهێز؛ بەزەبر. (٣) بەکار (جووت بوون)؛ توانای گانی زۆرە.
**virilism** (vir′əl-iz'm), *n.* دەرکەوتنی هەندێ تایبەخۆی پیاو لە ژندا (وەك تووکی دەموچاو).
**virility** (vi-ril′ə-ti), *n.* (١) بەکاری (جووت بوون)؛ توانای گان کردن. (٢) پیاوەتی؛ نێرێتی؛ مەردی؛ مەردایەتی؛ زەبر.
**virology** (vī-rōl′ə-ji), *n.* ڤایرۆسناسی: لێکۆڵینەوەی ڤایرۆس و نەخۆشی ڤایرۆسی
-virologist *(n.).*
**virosis** (vi-rō′sis), *n.* نەخۆشی ڤایرۆسی؛ نەخۆشییەکە لە ڤایرۆسەوە دادەکەوێ.
**virtu, vertu** (vēr-to͞o′, vũr′to͞o), *n.* (١) حەزی هونەر و شتی دەستکردی ئەنتیکەو نایاب؛ هونەرخوازی. (٢) جوانی و نایابی (شتی هونەری دەستکرد). (٣) شتی ئەنتیکەو نایابی دەستکرد بە گشتی.
**virtual** (vũr′cho͞o-əl), *adj.* (١) ڕاستی؛ بەڕاستی؛ تەواو:
*( Although we've met, he is a ~ stranger to me.)*
(٢) [Rare or Archaic]، کاریگەر:
*( a ~ defeat, promise, confession, etc.)*
-virtuality *(n.).*
**virtually** (vũr′cho͞o-əl-i), *adv.* لە ڕاستیدا؛ بەتەواوی؛ بە کردەوە؛ بە ڕاستی نەك بەناو:
*( He is ~ running the government.; The job was ~ completed by the end of the week.)*
**virtue** (vũr′cho͞o), *n.* (١) پاکی؛ چاکی؛ ڕاستی و ڕەووشت چاکی؛ کردەوەی باش. (٢) تایبەخۆ یا ڕەووشتێکی باش:
*( Generosity is a great ~ .)*
(٣) داوێن پاکی (بەتایبەتی بۆ ئافرەت)؛ پاکی.
(٤) (ا) بایەخ؛ چاکە؛ چاکی؛ باشی:
*( There is some ~ in what you say.)*
(ب) باشییەکی تایبەتی؛ تایبەخۆی بەسوود:
*( the ~s of teaching as a profession)*
(٥) توانای چاك کردنەوە یا بەهێزکردن: *( the ~ of a medicine)* .
(٦) [Obs.]، ئازایەتی؛ پیاوەتی؛ مەردایەتی.
(٧) پلەیەکە لە پلەکانی فریشتە.
by ( *or* in ), **virtue of,** لەبەر؛ بەهۆی؛ بە
*( By the virtue of the authority vested in me I pronounce you man and wife.)*
**make a virtue of necessity,** بە خۆشی خۆ کردنی کارێك کە بە ناچاری هەر دەبێت بکرێت

**virtuosity** (vūr´chōō-əs′ə-ti), *n.* (١) هونەرخوازی؛ حەزی هونەرو
شتی دەستکردی ئەنتیکەو نایاب. (٢) بەهرەی هونەری (بەتایبەتی مۆسیقا)؛
لێهاتوویی هونەریو تەکنیکی. (٣) هونەرخوازان بەگشتی.
**virtuoso** (vūr´chōō-ō′sō), *n.* (١) هونەرخواز؛ شتی هونەری نایابو
ئەنتیکە کۆکەرەوە. (٢) هونەرمەندی بەهرەدار؛ کەسێکی لێهاتوو (بەتایبەتی
لە هونەرە جوانەکاندا). (٣) مۆسیقاژەنێکی زۆر بە بەهرە.
(٤) [Obs.]: زانا.
**virtuous** (vūr′chōō-əs), *adj.* (١) رەووشت جوانو چاك؛ راست؛
پاك (٢): داوێن پاك (ئافرەت)؛ پاك: ***(a ~ woman)***.
(٣) [Archaic]: کاریگەر؛ بەکار.
**-virtuously** ***(adv.)***; **virtuousness** ***(n.)***.
**virulence** (vir′yoo-ləns), *n. Also* **virulency**, (١) ژەهراوێتی؛
کوشندەیی. (٢): پیسێتی یا بەتینی میکرۆب.
(٣) دوژمنایەتی؛ قینەبەرایەتی؛ دووبەرەکایەتی پیس؛ رق؛ ناحەزی.
**virulent** (vir′yoo-lənt, vir′oo-lənt), *adj.* (١) ژەهراوی؛
ژەهردار؛ کوشندە (٢) زۆر قیناوی؛ قین لە دڵ؛ رقاوی؛ زۆر دژو ناحەز.
(٣) (أ) پیس (نەخۆشی)؛ خێرا تووش دەبێت؛ درم.
(ب) پیس (میکرۆب، ڤایرۆس)؛ تێپەر.
**-virulently** ***(adv.)***.
**virus** (vī′rəs), *n.* (١) ژەهر؛ زەهر.
دەبێتەهۆی نەخۆشی؛ هۆی گەیاندن یا تووش کردنی نەخۆشی؛ میکرۆب.
(٣) دەرمانی کوتان. (٤) شتێکی ژەهر ئاسایی بۆ رەووشتو هەستو دەروون.
**vis** (vis), *n.* [L.], *pl.* vires, هێز
**visa** (vē′zə), *n.* ڤیزە؛ رێگەدان بە چوونەناو وولاتێکی بێگانەوە.
***v.t.*** (١) گوزەرنامە یا ڤیزە خستنەسەر پەساپۆرت.
(٢) گوزەرنامە پێدان؛ ڤیزە پێدان.
**visage** (viz′ij), *n.* (١) دەموچاو؛ رووخسار؛ روو؛ سەروچاو.
(٢) روو: رووالەت
**-visaged** (viz′ijd), پاشگرێکە بەمانای: جۆرە دەموچاوێکی تایبەتیدار:
***(round-visaged)***
**visard** (viz′ērd), *n.* = vizard.
**vis-à-vis** (vē´zə-vē′), *adj. & adv.* رووبەروو: بەرەو روو؛ بەرامبەر:
***(They were sitting ~ at the banquet table.)***
***prep.*** (١) بەرامبەر ***(his ambition ~ his capabilities)***.
(٢) دەربارەی؛ سەبارەت بە؛ دەرهەق بە؛ بەرامبەر:
***(his opinion ~ this issue)***
(٣) بەرامبەر (جێگە):
***(They were now ~ the most painting in the famous museum.)***
***n.*** (١) کەسێکی بەرامبەر: ***(He offered a cigarette to his ~.)***.
(٢) هاودەم؛ ناوەڵ. (٣) هاوتا (کاربەدەست، پلەوپایە).
(٤) گالیسکەیەکە کورسییەکانی بەرامبەر یا رووبەرووی یەکن.
(٥) کورسییەکە لە شێوەی S دا، دوو کەس رووبەروو لەسەری دادەنیشن.
(هەروەها " **tête-à-tête** ")
**viscacha** (vis-kä′chə), *n.* گیاندارێکی کرۆژەندی بچووکی ئەمەریکای
باشوورە
**viscera** (vis′ēr-ə), *n.pl.* (١) هەناو: ناوسك (٢) ریخۆڵە؛ ریخۆڵەکان.
**visceral** (vis′ēr-əl), *adj.* (١) هەناوی؛ ناوسکی؛ ریخۆڵەیی.
(٢) (أ) قووڵ (هەست)؛ هەناوی: ***(~ sensation)***.
(ب) هەستی؛ تایبەتی بە هەستی زۆر قووڵ نەك بە مێشك.
(٣) زگماکی؛ لەخۆوە ***(a ~ reaction)***.
**viscid** (vis′id), *adj.* (١) لینج: خەستولینج
(٢) بە ماددەیەکی لینج داپۆشراوە (گەلا).
**viscidity** (vi-sid′ə-ti), *n.* لینجی؛ لینجیو خەستی.
**viscoid** (vis′koid), *adj. Also* viscous, نەختێ لینج

**viscometer** (vis-kom′ə-tēr), *n.* لینجی پێوەر.
**viscose** (vis′kōs), *adj.* (١) لینج.
(٢) لە ماددەی " ڤیسکۆز " پێکهاتووە.
***n.*** ڤیسکۆز: ماددەیەکی لینجە لە دروستکردنی قوماشدا بەکاردێت.
**viscosimeter** (vis´kō-sim′ə-tēr), *n.* = **viscometer.**
**viscosity** (vis-kos′ə-ti), *n.* لینجی؛ خەستی؛ لینجیو خەستی.
**viscount** (vī′kount), *n.* ڤایکاونت: پلەو نازناوێکی خانەدانییە
لە خوار " کاونت " ەوەیەو لەژوور " بارۆن" ەوە.
**viscountcy** (vī′kount-si), *n.* پلەوپایەی " ڤایکاونت ".
(ووشەی پێشوو ببینە).
**viscountess** (vī′koun-tis), *n.* (١) ژنی ڤایکاونت. (٢) ڤایکاونتی ژن.
**viscountship** (vī′kount-ship´), *n.* = viscountcy.
**viscounty** (vī′koun-ti), *n.* (١) **viscountcy**.
(٢) ڤایکاونت نشین؛ ناوچەی ژێردەستی ڤایکاونت.
**viscous** (vis′kəs), *adj.* (١) لینج.
(٢) شتێکی لینجی پێوەیە (گەلا).
**viscus** (vis′kəs), *n.* [Rare], *singular of* **viscera.**
**vise** (vis), *n. Also* vice, مەنگەنە؛ گیرە.
***v.i.*** توندکردنەوە بە مەنگەنە؛ گرتن بە مەنگەنە یا گیرە.
**visé** (vē′zā, vē-zā′), *n. & v.t.* = visa.
**visibility** (viz´ə-bil′ə-ti), *n.* (١) لەبەرچاوبوون؛ دیاربوون؛
بینران؛ بە بەرچاوەوە بوون. (٢) ماوەی چاوبڕکردن؛ ماوەی بینین:
***(V- is one Kilometer.)***
**visible** (viz′ə-b'l), *adj.* (١) بە بەرچاوەوەیە؛ لەبەرچاوە؛ دەرکەوتوو؛
بە چاو دەبینرێ: ***(a ~ object; a ~ change of mood)***.
(٢) دیار؛ مێشك بۆی دەچێت؛ ئاشکرا: ***(a ~ solution)***.
(٣) لەبەردەستدایە؛ هەیە: ***(a ~ supply)***.
**-visibleness** ***(n.)***.
**visibly** (viz′ə-bli), *adv.* بە ئاشکرا؛ بە شێوەیەك کە دیار بێ:
***(He was ~ tired but happy.)***
**vision** (vizh′ən), *n.* (١) بینایی؛ بینین؛ چاوبڕکردن؛ توانای بینین.
(٢) سرووشت (٣) خەیاڵی خاو؛ خەیاڵ: ***(He had ~s of greatness.)***
(٤) توانای هێنانە بەرچاو؛ توانای خەیاڵ کردنەوە.
(٥) بینایی؛ دووربینی؛ باش بینی: ***(a leader of great ~)***.
(٦) خەو؛ خەوبینین
(٧) کەسێك یا شتێکی زۆر جوان؛ ژنێکی زۆر جوان.
***v.t.*** هێنانە بەرچاوی خۆ؛ بینین یا هاتنەبەرچاو هەر وەك لە خەودا.
**-visional** ***(adj.)***.
**visionary** (vizh′ən-er´i), *adj.* (١) خەیاڵ خاو؛ خەیاڵ پەرست.
(٢) ناکردەنی؛ خەیاڵی؛ ناهێنرێتە دی (نەخشە، بیروباوەڕ).
***n.*** (١) کەسێکی خەیاڵ خاو؛ خەیاڵ پەرست.
(٢) دووربین؛ باش بین؛ کەسێکی بیروڕا بەرز دەربارەی دواڕۆژ.
**visit** (viz′it), *v.t.* (١) سەرلێدان؛ دیدەنی کردن؛ چوونە لا:
***(She ~ed her aunt.)***
(٢) چوون (بۆ گەشت): ***(We ~ed the library.)***.
(٣) میوانداری پێکردن (بۆ ماوەیەکی نەختێ درێژ)؛ بوون بە میوان.
(٤) سەرلێدان (بۆ پشکنین یا بە ئیشوکاری رەسمی).
(٥) سەرلێدان (بۆ دڵنیایی یا یارمەتی):
***(to ~ the wounded; The doctor ~s his patients daily.)***
(٦) تووش بوون (بەڵا): ***(A plague ~ed the village.)***.
(٧) تۆڵە لێکردنەوە؛ سزادان: ***(I shall ~ their sin upon them.)***
***v.i.*** (١) سەرلێدان؛ دیدەنی کردن؛ چوونە لا. (٢) تۆڵە لێکردنەوە؛ سزادان.
(٣) قسە لەگەڵ کردن؛ دەمەتەقێ کردن:
***(I stayed and ~ed with her for a while.)***
***n.*** (١) دیدەنی؛ سەردان؛ چوونە لا. (٢) میوانداری؛ مانەوە بە میوانی.

(٣) سەرلێدان (بۆ پشکنین یا ئیش‌وکاری ڕەسمی).
(٤) [Colloq.]. دەمەتەقێ؛ گفتوگۆ؛ دووان

**visitant** (viz′ə-tənt), *n.* (١) میوان؛ میوانی سەردەمی.
(٢) خێو (٣) باڵندەی کۆچەر.
*adj.* [Archaic]. هی سەرلێدان یا میوانداری؛ میوانی.

**visitation** (viz′ə-tā′shən), *n.* (١) سەردان؛ چوونە لا.
(٢) سەردانی پشکنین یا ئیش‌وکاری ڕەسمی.
(٣) مافی سەردانی منداڵ لەلایەن باوك یا دایکەوە پاش تەڵاق.
(٤) (أ) سزای خوایی؛ پاداشتی خوایی. (ب) بەڵا؛ کارەسات.
(٥) دەرکەوتنی خێو یا بوونەوەرێکی سەرئاسا
(٦) [V-] (أ) دەرکەوتنی حەزرەتی مریەم بۆ ئەلیزابیس (ئینجیل).
(ب) جەژنی ئەم دەرکەوتنە.
(٧) سەردانی باڵندەو گیانداری کۆچەر بۆ شوێنێك لە کاتێکی نائاساییداو بە ژمارەیەکی زۆر.

-**visitational** *(adj.)*.

**visitatorial** (viz′i-tə-tôr′i-əl, viz′i-tə-tō′ri-əl), *adj.* *Also* **visitorial**, (١) تایبەتی بە سەردانی پشکنین یا ڕەسمی.
(٢) مافی سەردانی هەیە

**visiting card**, = calling card.

**visiting nurse**, نەخۆشەوانی گەڕۆك: نەخۆشەوانێکە کە دەچێتە ماڵی نەخۆش بۆ تیمارکردنی.

**visiting professor**, مامۆستای میوان: مامۆستایەکی زانکۆیە کە بە میوانی لە زانکۆیەکی جیا لەوەی خۆی کاردەکات بۆ وەرزێك یا ساڵێك.

**visiting teacher**, مامۆستای گەڕۆك: مامۆستایەکە کە دەچێتە ماڵی قوتابی نەخۆش بۆئەوەی پێی بخوێنێت.

**visitor** (viz′ə-tẽr), *n.* (١) میوان (٢) گەشتیار؛ گەشتکەر.

**visor** (vī′zẽr), *n.* *Also* **vizor**, (١) ڕووپۆشی کڵاوزرێ (کە دەتوانرێ لابرێ بەتایبەتی ئەو بەشەی کە چاو دادەپۆشێ).
(٢) ڕووپۆش؛ دەماخ؛ ڕووبەند (٣) لێواری شەپقە (بۆ سێبەر).
(٤) پەردە یا خۆرپۆشی ئوتومبیل: پەردەیەکی بچووکە بە سەرووی شووشەی پێشەوەی ئوتومبیلەوە لە دیوی ناوەوە بۆ سێبەر
*v.t.* سێبەر بۆ کردن؛ داپۆشین؛ پۆشین؛ شاردنەوە.

**vista** (vis′tə), *n.* (١) دیمەنێکی درێژ هەتا چاوبڕبکات (بەتایبەتی لە ڕاڕەوێکەوە ببینرێ وەك لەبەینی ڕیزە خانوو یا دارەوە).
(٢) ئەو ڕاڕەوەی کە دیمەنێکی وەهای لێوە دەبینرێ.
(٣) دیمەنێکی ناو مێشك دەربارەی ڕابوردوو یا دواڕۆژ.
(٤) ئاسۆ

**visual** (vizh′ōō-əl), *adj.* (١) دیدەیی؛ هی هەستی بینین؛ هی بینین؛ دیدەنی؛ دیداری. (٢) بینراو؛ دیار؛ لەبەرچاو. (٣) هەر بە چاو کراو.
(٤) هی هۆی فێرکردن یا ڕوونکردنەوەی بینەری
(٥) هی چاوو بینایی (بینایی زانی).

-**visually** *(adv.)*.

**visual aids**, هۆی ڕوونکردنەوەی بینەری؛ کەرەسەی ڕوونکردنەوەی بینەری

**visualize** (vizh′ōō-əl-īz′), *v.t. & v.i.* هێنانە بەرچاوی خۆ

-**visualization** *(n.)*.

**vita** (vī′tə), *n.* ژیننامە: کورتەی مێژووی خوێندن‌و شارەزایی ئیشی کەسێکە کە بۆ ئیش دەگەڕێ پێشکەشی دەکات بە خاوەن ئیش.
(هەروەها پێشی دەوترێ: " resumé " و " curriculum vitae ").

**vital** (vī′t'l), *adj.* (١) زیندەگی؛ ژیانی؛ زیندەکاری: *( ~ energy)*.
(٢) پێویستە بۆ ژیان؛ زیندەبەخشی سەرەکی *( ~ organs)*
(٣) کوشندە؛ بکوژ *( a ~ wound)*
(٤) (أ) زۆر گرنگ؛ بنچینەیی؛ سەرەکی *( a ~ element)*
(ب) زۆر پێویست
(٥) چوست‌وچالاك؛ گورج‌وگۆڵ؛ زیندوو؛ بەگوڕ *( a ~ personality)*.
(٦) تایبەتی بە ژیننامەی خەڵك (زێنامە، مارەیی، مردن): *( ~ records)*
*n.pl.* (١) ئەندامە زیندەکارییە سەرەکییەکان (دڵ، مێشك‌و سییەکان... هتد)
(٢) بەشە زۆر گرنگ‌و پێویستەکانی شتێك.

-**vitally** *(adv.)*; **vitalness** *(n.)*.

**vitalism** (vī′t'l-iz'm), *n.* زیندەگێتی؛ زیندەبەخشێتی؛ زیندەکارێتی: فەلسەفەیەکە دەڵێت: ژیان لەسەر بنچینەیەکی زیندەگی تایبەتی بەندە کە جیایە لە کرداری کیمیایی‌و فیزیایی؛ بڕوابوون بە بێ هاوتایەتی‌و ڕەسەنێتی بنچینەی ژیان.

-**vitalist** *(n.)*; **vitalistic** *(adj.)*.

**vitality** (vī-tal′ə-ti), *n.* (١) زیندەکاری؛ زیندەگی؛ ژیان؛ زیندوویێتی؛ ژین. (٢) توانای مانەوەو ژیان‌و پەرەسەندن.
(٣) چالاکی؛ چوست‌وچالاکی؛ گورج‌وگۆڵی؛ ووزە؛ تین؛ بەتینی

**vitalize** (vī′t'l-īz′), *v.t.* *Also* **vitalise**, (١) ژین پێ بەخشین.
(٢) بووژاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ چوست‌وچالاك کردن؛ بەتین کردن

-**vitalization** *(n.)*; **vitalizer** *(n.)*.

**vitals** (vī′t'ls), *n.pl.* (١) ئەندامە زیندەکارییە سەرەکییەکان (وەك: دڵ، مێشك‌و سییەکان... هتد) (٢) بەشە زۆر گرنگ‌و پێویستەکانی شتێك

**vital statistics**, زانیاری ژیان: زانیارییەکە دەربارەی ژیننامەی کەسێك (وەك لەدایکبوون‌و ژنهێنان‌و مردن... هتد).

**vitamin** (vī′tə-min), *n.* *Also* **vitamine**, ڤیتامین.

**vitascope** (vī′tə-skōp′), *n.* شەرق هاوێژ یا مەکینەی سینەمای کۆن.

**vitellin** (vi-tel′in, vī-tel′in), *n.* ڤیتالین: پرۆتینی زەردێنەی هێلکە.

**vitelline** (vi-tel′in, vī-tel′in), *adj.* (١) تایبەتی بە زەردێنەی هێلکە: *( the ~ membrane)*.
(٢) زەرد؛ هی زەردی زەردێنەی هێلکە.
*n.* زەردێنەی هێلکە.

**vitellus** (vi-tel′əs, vī-tel′əs), *n.* زەردێنەی هێلکە.

**vitiate** (vish′i-āt′), *v.t.* (١) خراپ کردن؛ تێکدان؛ پیس کردن.
(٢) لەکەدارکردن؛ سووك کردن.
(٣) بەتاڵ کردنەوە (قۆنتەرات، پەیمان)؛ پووچ کردنەوە:
*( to ~ a contract, claim, etc.)*

-**vitiable** *(adj.)*; **vitiator** *(n.)*.

**vitiated** (vish′i-āt′id), *adj.* (١) خراپ کراو؛ تێکدراو؛ پیس.
(٢) لەکەدارکراو؛ سووك. (٣) بەتاڵ (قۆنتەرات، پەیمان)؛ پووچ کراوە.

**vitiation** (vish′i-ā′shən), *n.* (١) خراپ کردن؛ تێکدان.
(٢) لەکەداری؛ لەکەدارکردن؛ سووکی؛ سووك کردن.
(٣) بەتاڵ کردنەوە؛ پووچ کردنەوە.

**viticulture** (vit′i-kul′chẽr), *n.* مێو پەروەردەکردن.

-**viticultural** *(adj.)*; **viticulturalist** *(n.)*.

**vitiligo** (vit′i-lī′gō), *n.* نەخۆشییەکی پێستە دەبێتەهۆی پەیدابوونی پەڵەپەڵەی سپی وەك پینە بە پێستەوە (بەتایبەتی بە دەست‌و دەم‌وچاوەوە).

**vitreous** (vit′ri-əs), *adj.* (١) شووشەیی؛ لە شووشە دەچێت
(٢) لە شووشە درووستکراو؛ شووشە.
(٣) تایبەتی بە شلاوی شووشەیی (ووشەی داهاتوو ببینە).

**vitreous humor ( or body )**, شلاوی شووشەیی: ماددەیەکی ڕوونی جەلاتینییە لە چاودا

**vitrescence** (vi-tres′'ns), *n.* (١) بوون بە شووشە. (٢) شووشەیەتی.

**vitrescent** (vi-tres′'nt), *adj.* (١) دەتوانرێ بکرێ بە شووشە.
(٢) وەك شووشە لێ هاتوو

**vitric** (vit′rik), *adj.* شووشەیی؛ لە شووشە دەکات.

**vitrics** (vit′riks), *n.pl.* (١) شووشەزانی؛ درووستکردن‌و نەخشاندنی دەفری شووشە؛ شووشەکاری (٢) دەفری شووشە؛ شتی شووشە

**vitrification** (vit′rə-fi-kā′shən), *n.* (١) کردن بە شووشە؛ بوون بە شووشە (٢) شتێکی کراو بە شووشە.

**vitrify** (vit′rə-fī′), *v.t. & v.i.* کردن بە شووشە.

-vitrifiable *(adj.).*

**vitriol** (vit′ri-əl), ***n.*** (١) زاخ؛ زاج
(٢) شتێکی تیژ؛ وتەو هەستی توندوتیژ؛ قسەی زۆر ڕەق:
***( His language was pure ~ .)***
***v.t.*** زاخاودانەوە

**vitriolic** (vit′ri-ol′ik), ***adj.*** (١) زاخی؛ لە زاخ دەچێ؛ زاخاوی؛ لە زاخ دەرهێنراوە. (٢) تیژ؛ توندوتیژ؛ بڕ؛ تاڵ: ***( ~ talk)***

**vitta** (vit′ə), ***n.*** (١) سەرپێچ
(٢) بۆری ڕۆن لە بەری سەوزەی وەك گێزەردا).
(٣) هێڵی ڕەنگاوڕەنگ (گیانەوەرناسی، ڕووەکناسی).

-vittate *(adj.).*

**vittle** (vit′'l), ***n.*** [Dial.], = victual.

**vituline** (vich′oo-līn′, vich′oo-lin), ***adj.*** گوێرەکەیی؛ هی گوێرەکە

**vituperate** (vī-tōō′pə-rāt′, vi-tū′pə-rāt′), ***v.t.*** جوێن پێدان؛ بەتوندی سەرزەنشت کردن؛ قسەی سووك پێ ووتن؛ شکاندن؛ بەدگۆیی کردن.

-vituperative *(adj.)*; vituperator *(n.)*; vituperatory *(adj.).*

**vituperation** (vī-tōō′pə-rā′shən), ***n.*** (١) سەرزەنشت کردن بەتوندی؛ جوێن پێدان؛ قسەی سووك پێ ووتن؛ شکاندن.
(٢) سەرزەنشتی توند؛ جوێن؛ قسەی پیس؛ بەدگۆیی.

**viva** (vē′vä), ***interj.*** بژی!؛ هەر بژی!
***n.*** هاواری " بژی "

**vivacious** (vi-vā′shəs, vī-vā′shəs), ***adj.*** (١) ڕووخۆش؛ چالاك؛ دەم بە پێکەنین: ***( a ~ girl)*** .
(٢) [Archaic]. تەمەن درێژ؛ نەبەز؛ نەمر.

-vivaciously *(adv.)*; vivaciousness *(n.).*

**vivacity** (vi-vas′ə-ti, vī-vas′ə-ti), ***n.*** ڕووخۆشی؛ چالاکی.

**vivandière** (vē′vän′dyâr′), ***n.*** ئافرەتی شەراب و ئازووقە فرۆش بە لەشکر

**vivarium** (vī-vâr′i-əm), ***n.*** پەروەردگایەکی گیاندارو ڕووەکە کە لە دەوروبەری سرووشتی خۆیان دەچێت.

**viva-voce** (vī′və-vō′si), ***adj.*** بە زار؛ زاری؛ دەمی؛ بە دەمی.

**vive** (vēv), ***interj.*** [Fr.], بژی!؛ هەر بژی!

**viverine** (vī-ver′īn, vi-ver′in), ***adj.*** زەبادی؛ تایبەتی بە توخمی گیاندارێکە لە پشیلە دەچن بۆنێکی خۆشیان لێ دەردەهێنرێت.
(ووشەی " civet " ببینە)
***n.*** گیاندارێکی ئەم توخمە.

**vivid** (viv′id), ***adj.*** (١) چوست و چالاك؛ بەتین؛ زیندوو؛ بە گڤ و گوڕ؛ ووریا: ***( a ~ personality)*** .
(٢) ڕۆشن؛ ڕووناك؛ بەشەوق؛ گەش: ***( the ~ evening star)*** .
(٣) (ا) کراوە: ڕەنگ؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕۆشن: ***( a ~ painting)*** .
(ب) زەق (ڕەنگ)؛ گەش.
(٤) بەهێز؛ بە ڕوونی دەبینێ؛ ڕوون: ***( a ~ imagination)*** .
(٥) ڕوون؛ دیار؛ باش دەرخراو: ***( a ~ description)*** .

-vividly *(adv.)*; vividness *(n.).*

**vivify** (viv′ə-fī′), ***v.t.*** (١) بووژاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ بزواندن.
(٢) (ا) جوان دەرخستن؛ باش ڕوونکردنەوە؛ ڕۆشن کردنەوە.
(ب) چاکترکردن؛ ووریاترکردن.

-vivification *(n.)*; vivifier *(n.).*

**viviparity** (viv′ə-par′ə-ti), ***n.*** بەچکەزێیی؛ بەچکەکەری

**viviparous** (vī-vip′ə-rəs), ***adj.*** (١) بەچکەزێ؛ بەچکەکەر؛ زاووزێکەر لەرێی بەچکەکردنەوە نەك لەرێی هێلکەکردنەوە.
(٢) (ا) تۆوەکەی دەپشکوێت پێش جیابوونەوە لە ڕووەکەکە.
(ب) بە سەلك یا ئەمامی بچووك زیاد دەکات نەك بە تۆو.

**vivisect** (viv′ə-sekt′, viv′ə-sekt′), ***v.t. & v.i.*** توێ توێ کردنی گیانەوەری زیندوو (بۆ مەبەستی زانستی).

-vivisector *(n.).*

**vivisection** (viv′ə-sek′shən), ***n.*** توێکاری گیانەوەری زیندوو (بۆ مەبەستی زانستی)؛ یەکلاکردنەوەی زیندەوەر.

-vivisectional *(adj.)*; vivisectionist *(n.).*

**vixen** (vik′s'n), ***n.*** (١) ڕێوی مێ.
(٢) ژنێکی بێ حەیای دەم پیسی بەدخووی تووڕەوتیژ.

-vixenish *(adj.)*; vixenly *(adv.).*

**viz.** (viz), ( *usually read* " namely " ), = videlicet.

**vizard** (viz′ērd), ***n.*** ***Also*** visard, (١) visor . (٢) mask .

**vizier, vizir** (vi-zêr′, viz′yēr), ***n.*** وەزیر؛ شالیار.

-vizierial *(adj.).*

**vizierate** (vi-zêr′it, viz′yēr-āt′), ***n.*** ***Also*** viziership, وەزیری؛ وەزارەت؛ پلەی وەزیر.

**vizor** (vī′zēr), ***n.*** = visor.

**vocable** (vō′kə-b'l), ***n.*** ووتە (بەتایبەتی لەڕووی دەنگ یا بێژانەوە نەك لەڕووی ماناوە)؛ ووشە

**vocabulary** (vō-kab′yoo-ler′i, və-kab′yoo-ler′i), ***n.*** (١) (ا) فەرهەنگ؛ فەرهەنگۆك. (ب) لیستەی ووشەکان؛ ووشەکان.
(٢) هەموو ووشەکانی زمانێك.
(٣) هەموو ئەو ووشانەی کە کەسێك یا چینێك بەکاری دەهێنن.

**vocal** (vō′k'l), ***adj.*** (١) دەنگی؛ بێژراو؛ ووتراو (بە دەنگی بەرز): ***( a ~ prayer)***
(٢) زماندار؛ قسەکەر؛ دەتوانێت بێژێ.
(٣) دەنگی؛ لە دەنگدا بەکارهێنراو: ***( ~ organs)*** .
(٤) دەنگدار؛ دەنگدەرەوە؛ پڕ لە دەنگ.
(٥) دەم هەراش؛ بە دەم؛ دەم درێژ؛ قسە لەڕوو.
(٦) (ا) vocalic . (ب) voiced .
***n.*** (١) تیپی دەنگدار. (٢) گۆرانی (بەتایبەتی بە مۆسیقاوە).

**vocal cords,** دەنگەژێ؛ ژێی دەنگ (دەنگناسی).

**vocalic** (vō-kal′ik), ***adj.*** (١) لە تیپە بزوێن پێکهاتوو؛ چەند تیپە بزوێنێکی تێدایە. (٢) تیپە بزوێنی؛ چەند دەنگە بزوێنێکی تێدایە.

**vocalism** (vō′k'l-iz'm), ***n.*** (١) بێژان؛ ووتن؛ دەنگ بەکارهێنان (لە گفتوگۆو گۆرانیدا). (٢) گۆرانی ووتن. (٣) تیپە بزوێن؛ دەنگی تیپە بزوێن.
(٤) هەموو تیپە بزوێنی زمانێك.

**vocalist** (vō′k'l-ist), ***n.*** گۆرانی بێژ.

**vocalize** (vō′k'l-īz′), ***v.t.*** (١) بێژان (بە قسە یا بە گۆرانی)؛ بە دەنگی بەرز ووتن؛ ووتن. (٢) دەربڕین. (٣) سەروبۆر بۆکردن (زمانی عەرەبی).
(٤) (ا) تیپی ئابزوێن یا بێ دەنگ وەك تیپە بزوێن لێکردن (لە بێژاندا)
(ب) وەك تیپی دەنگدار بێژان (تیپی " f " وەك " v " ووتن) .
***v.i.*** (١) بە گۆرانی ووتن؛ کردن بە گۆرانی؛ بە دەنگی بەرز ووتن؛ ووتن.
(٢) بوون بە تیپە بزوێن (لە تیپی ئابزوێن یا بێ دەنگەوە).

-vocalization *(n.)*; vocalizer *(n.).*

**vocally** (vō′k'l-i), ***adv.*** (١) بە دەم؛ بە دەنگ؛ بە دەنگی بەرز.
(٢) بە گۆرانی. (٣) لە بابەت تیپە بزوێنەوە؛ لەڕووی تیپە بزوێنەوە.

**vocation** (vō-kā′shən), ***n.*** (١) بانگی چارەنووسی: هەستی مرۆڤ کە شتێك بانگی دەکات یا پاڵی پێوە دەنێت بۆ پیشەیەك بەتایبەتی هی ئاینی.
(٢) ئەو پیشەیەی مرۆڤێك هەست دەکات بۆی بانگ کراوە (بەتایبەتی ئەرکێکی ئاینی یا کۆمەڵایەتی). (٣) پیشە؛ پیشەگەری.

**vocational** (vō-kā′shən-'l), ***adj.*** پیشەیی؛ پیشەگەری: ***( a ~ school)***

-vocationally *(adv.).*

**vocational education,** پەروەردەی پیشەیی یا پیشەگەری.

**vocative** (vok′ə-tiv), ***adj.*** (١) بانگەوازی؛ بانگی؛ تایبەتی بە بانگ کردن. (٢) تایبەتی بە ڕێژەی بانگ یا بانگ کردن (ڕێزمان).

***n.*** (١) ڕیژەی بانگ یا بانگ کردن (ڕێزمان). (٢) ووشەیەکی ئەم ڕێژەیە.

**vociferance** (vō-sif′ēr-əns), *n.* دەنگەدەنگ؛ هاوار؛ قیژە

**vociferant** (vō-sif′ēr-ənt), *adj. & n.* هاوارکەر؛ قیژەکەر

**vociferate** (vō-sif′ə-rāt′), *v.t. & v.i.* هاوارکردن؛ قیژاندن؛
بە دەنگی بەرز داواکردن.

**-vociferation** *(n.)*; **vociferator** *(n.)*.

**vociferous** (vō-sif′ēr-əs), *adj.* هاوار؛ هاوارکەر؛ قیژەقیژکەر؛
دەم درێژ؛ بە دەم؛ دەم هەراش؛ بە توند داواکەر:
***( a ~ demand; a ~ manner of expression)***

**-vociferously** *(adv.)*; **vociferousness** *(n.)*.

**vodka** (vod′kə), *n.* ڤۆدکا: خواردنەوەیەکی مەستکەری ڕوسییە.

**vogue** (vōg), *n.* (١) مۆدە؛ باو: ***( Mini skirts were once in ~ .)***
(٢) برەو؛ بەبرەوبوون؛ لەبرەودابوون.

**voguish** (vō′gish), *adj.* (١) لەسەر مۆدە؛ مۆدە؛ جوان؛ ڕێکوپێک.
(٢) بەبرەو؛ بەباو.

**voice** (vois), *n.* (١) دەنگی مرۆڤ.
(٢) توانای دەنگ کردن: ***( He lost his ~ .)***
(٣) (أ) دەنگ؛ ووتە. ***( the ~ of the sea.)***
(ب) دەنگ (ڕاگەیاندن): ***( the ~ of his conscience)***
(٤) دەنگێکی تایبەتی؛ دەنگی کەسێک ***( I recognized John's ~ .)***
(٥) ڕا؛ حەز؛ دەنگ.
(٦) مافی دەربڕینی ئەم دەنگە یا ڕایە:
***( We have a ~ in our government.)***
(٧) دەربڕین ***( Give ~ to your concerns.)***
(٨) هۆی دەربڕین: ***( This newspaper is the ~ of the people.)***
(٩) [Obs.] (أ) قاو؛ ووتووات؛ دەنگ (ب) ناو؛ ناوبانگ.
(١٠) ڕێژەی کردار (ڕێزمان): ***( active ~ ; passive ~ )***
(١١) (أ) ئاواز؛ گۆرانی؛ دەنگی گۆرانی.
(ب) جۆنیەتی دەنگ یا ئاوازی گۆرانی بێژ: ***( He has a good ~ .)***
(ج) گۆرانی بێژ. (د) یەکێك لە دەنگەکانی گۆرانییەکی هەمەدەنگی.
(هـ) توانای گۆرانی ووتن. ***( She really has no ~ .)***
(١٢) دەنگ (دەنگناسی): (وەك دەنگی تیپە بزوێنەکان و تیپی دەنگداری وەك:
h ، d ، g ، m ... هتد).

***v.t.*** (١) دەربڕین ***( He gives ~ to his opinions freely.)***
(٢) سازکردن (ئامێری مۆسیقا)؛ خۆش نەوا کردن.
(٣) بە دەنگەوە ووتن (دەنگناسی).

**in voice,** دەنگ لەبار (بۆ گۆرانی ووتن)

**with one voice,** هەموو بە یەك دەنگ؛ هەموو پێکەوە

**voice box,** = larynx.

**voiced** (voist), *adj.* (١) دەنگدار؛ زماندار؛ قسەکەر
(٢) دەنگێکی تایبەتی هەیە ***( deep- ~ )***
(٣) دەربڕاو؛ بە دەنگ ووتراو
(٤) دەنگدار (دەنگناسی) (وەك تیپی ژ، ڤ، گ).

**voiceful** (vois′fəl), *adj.* دەنگ گەورە؛ دەنگدار (بەتایبەتی دەنگی زل)؛
دەنگدەرەوە

**voiceless** (vois′lis), *adj.* (١) لاڵ؛ بێ زمان (٢) بێ دەنگ؛ نەدوو
(٣) دەرنەبڕاو؛ نەووتراو ***( a ~ wish)***
(٤) دەنگی ناخۆشە؛ دەنگی بۆ گۆرانی ووتن ناشێ؛ بێ ئاواز.
(٥) بێ دەنگ (هەڵبژاردن)؛ بێ مافی دەنگدان ***( the ~ masses)***
(٦) بێ دەنگ نییە ***( K, P, T, etc. are ~ consonants.)***

**-voicelessly** *(adv.)*; **voicelessness** *(n.)*.

**void** (void), *adj.* (١) چۆڵ (خانوو، جێ)؛ بەتاڵ (٢) بۆش
(٣) ( ~ of ) بێ ***( ~ of common sense)***
(٤) بێ سوود؛ بێ کەڵك؛ هیچ
(٥) پووچ؛ بەتاڵ.
***( The agreement, not having been signed, was ~ .)***

***n.*** (١) شوێنی چۆڵ یا بەتاڵ؛ بەتاڵی؛ چۆڵی.
(٢) هەستی وونکردن یا لە دەست چوون؛ هەستی بۆشایی لە ژیاندا:
***( His death left a ~ in her life.)***
(٣) بۆشایی؛ بۆش؛ درز؛ کەلەبەر.

***v.t.*** (١) چۆڵ کردن؛ بەجێهێشتن. (٢) (أ) بەتاڵ کردن؛ ڕۆکردن.
(ب) لە لەش کردنەدەرەوە؛ میزو گوو کردن؛ خۆ بەتاڵ کردنەوە.
(٣) پووچ کردنەوە؛ بەتاڵ کردنەوە (بەڵگەنامە):
***( to void a contract, lease, passport, an agreement, etc.)***

**voidable** (void′ə-b'l), *adj.* پووچ دەکرێتەوە؛ دەتوانرێ بەتاڵ
بکرێتەوە (بەڵگەنامە): ***( a ~ contract, agreement, etc.)***

**voidance** (void′'ns), *n.* (١) پووچ کردنەوە؛ بەتاڵ کردنەوە (پەیمان،
قۆنتەرات، بەڵگەنامە) (٢) بەتاڵی؛ بۆشی؛ خاڵیێتی.
(٣) بەتاڵ کردن؛ ڕۆکردن. (٤) چۆڵ کردن؛ دەرکردن.

**voided** (void′id), *adj.* (١) پووچ کراوە؛ بەتاڵ کراوە (بەڵگەنامە).
(٢) بۆش کراو؛ کون تێکراو. (٣) ناوەڕاستەکەی هەڵکۆڵراوە یا کون کراوە و
قەراغەکەی ماوەتەوە (درووشمی سوارچاکی).

**voilà** (vwä′lä′), *interj.* [Fr.]. سەیر کە!؛ بڕوانە !؛ ئەوەتا !.

**voile** (voil), *n.* قوماشێکی تەنکە (بۆ کراس و پەردە... هتد بەکاردێت).

**voir dire** (vwär′ dêr′), [Fr.], سوێند (کە شایەت یا سوێندخۆر
دەیخوات لە دادگادا).

**volant** (vō′lənt), *adj.* (١) فڕیو؛ فڕۆك؛ دەتوانێ بفڕێ
(٢) خێرا؛ تیژڕەو؛ گورج و گۆڵ؛ سووکەڵەو خێرا.
(٣) وەك باڵندە یا بە فڕین کراوە (درووشمی سوارچاکی).

**volar** (vō′lēr), *adj.* هی بەری لەپ یا بنی پێ.

**volatile** (vol′ə-t'l), *adj.* (١) زوو دەبێتە هەڵم (لە پلەی گەرمی و
پەستۆی ئاساییدا)؛ زوو پەرش دەبێت یا نامێنێ.
(٢) لە تەقینەوەدایە؛ زوو هەڵدەچێ:
***( a ~ political situation; a ~ temper)***
(٣) زوو گۆڕاو؛ هەمیشە گۆڕاو؛ حولحولی: ***( a ~ disposition)***
(٤) سەردەمی؛ کاتی؛ کەم خایەن؛ کورت: ***( ~ beauty)***
(٥) [Archaic]، فڕۆك؛ دەفڕێت؛ دەتوانێ بفڕێ.

**volatility** (vol′ə-til′ə-ti), *n.* (١) زوو بوون بە هەڵم
(٢) زوو هەڵچوون؛ زوو تەقینەوە.
(٣) زوو زوو گۆڕان؛ هەمیشە گۆڕان؛ حولحولێتی.

**volatilize** (vol′ə-t'l-īz′), *v.t.* پەرش کردن لە ڕێی کردن بە هەڵم؛
کردن بە هەڵم

*v.i.* بوون بە هەڵم؛ پەرش بوون لە ڕێی بوون بە هەڵمەوە.

**-volatilization** *(n.)*.

**volcanic** (vol-kan′ik), *adj.* (١) ئاگرپژێنی.
(٢) بە ئاگرپژێن درووست بوو؛ ئاگرپژێناوی؛ ئاگرپژێنی لێ ڕوو دەدات
(٣) توندوتیژ؛ ئاگرین؛ زوو هەڵچوو: ***( a ~ temper)***

***n.*** بەردی ئاگرپژێنی

**-volcanically** *(adv.)*.

**volcanic glass,** شووشەی ئاگرپژێنی: پەیدا دەبێت کە شلاوی
ئاگرپژێنی زۆر خێرا سارد دەبێتەوە.

**volcanicity** (vol′kə-nis′ə-ti), *n.* = **volcanism.**

**volcanism** (vol′kə-niz'm), *n.* جموجوولی ئاگرپژێنی؛
دیاردەی ئاگرپژێنی.

**volcanize** (vol′kə-nīz′), *v.t.* دانەبەر گەرمی ئاگرپژێن؛
بە گەرمی ئاگرپژێن گۆڕین

**volcano** (vol-kā′nō), *n.* ئاگرپژێن؛ کێوی ئاگرین؛ بورکان.

**volcanology** (vol′kə-nol′ə-ji), *n.* ئاگرپژێن زانی؛
زانستی ئاگرپژێن. (هەروەها " vulcanology ").

**-volcanological** *(adj.)*; **volcanologist** *(n.)*.

**vole** (vōl), *n.* مشکی دەشتی؛ گیاندارێکی کرۆژەندەی وەك مشکە لەناو زەویدا دەژی

**vole** (vōl), *n. & v.i.* بردنەوەی دەستێك قومار.

**go the vole,** هەموو شت خستنە مەترسییەوە بۆ دەسکەوتێکی گەورە.

**volery** (vol′ēr-i), *n.* (۱) aviary.

(۲) [Rare]، مەلی مەلخانە؛ باڵندەی پەروەردەکراو لە شوێنێکدا.

**volitant** (vol′ə-tənt), *adj.* (۱) فڕۆك؛ دەتوانێ بفڕێ

(۲) بزۆك؛ هەمیشە جووڵاو

**volitation** (vol′ə-tā′shən), *n.* (۱) فڕین (۲) توانای فڕین

**volition** (vō-lish′ən), *n.* (۱) خواست؛ خواز؛ ویستن؛ حەز:

*(He left of his own ~.)*

(۲) بڕیار؛ بڕینەوە

(۳) توانای هەڵبژاردن یا بڕیاردان.

**-volitional** *(adj.)*; **volitionally** *(adv.)*.

**volitive** (vol′ə-tiv), *adj.* (۱) خواستی؛ هی ویستن.

(۲) هی ڕێژەی خواست (ڕێزمان).

**volley** (vol′i), *n.* (۱) دەسرێژ *(a ~ of bullets, stones, etc.)*.

(۲) لێشاو (پرسیار، جوێن، سکاڵا ... هتد): *(a ~ of courses, protests)*

(۳) یاری بە تۆپ کردن پێش بەر زەوی کەوتن (تەنس، باڵە، فتبۆڵێن).

*v.t.* (۱) دەسرێژلێکردن (۲) یاری بە تۆپ کردن پێش لە زەوی دان (تەنس، باڵە، فتبۆڵێن)

*v.i.* وەك دەسرێژ دەرپەڕین؛ وەك لێشاو هاتن.

**volleyball** (vol′i-bôl′), *n.* (۱) باڵە؛ یاری باڵە (۲) تۆپی باڵە

**volplane** (vol′plān′), *v.i.* خزان یا خشانی فڕۆکە بەرەو زەمین بەبێ مەکینە

*n.* ئەم جۆرە خزانە یا خشانە

**volt** (vōlt), *n.* (۱) پۆیشتنێکی بازنەیی یا سووڕاوەیی ئەسپ (مەشق و خۆنواندی ئەسپ (۲) قەڵەمبازێك یا جووڵەیەکی لەپڕە بۆ خۆ لادان لە شیر (شیربازی).

**volt** (vōlt), *n.* ڤۆڵت یەکەی هێزی کارەبا؛ پێوانەی هێزی کارەبا.

**voltage** (vōl′tij), *n.* هێزی کارەبای بە ڤۆڵت پێوراو.

**voltaic** (vol-tā′ik), *adj.* = galvanic.

**voltaism** (vol′tə-iz′m), *n.* = galvanism.

**voltameter** (vōlt′am′mē′tēr), *n.* ڤۆڵتامەتر پێوەری ڤۆڵت و ئەمپێر

**volt-ampere** (vōlt′am′pêr), *n.* ڤۆڵت-ئەمپێر یەکەی هێزی کارەبایە کە ئەنجامی لێکدانی ڤۆڵتێك و ئەمپێرێکە؛ یەك وات

**volte-face** (volt′fäs′, vol′tə-fäs′), *n.* about-face.

**voltmeter** (vōlt′mē′tēr), *n.* ڤۆڵتامەتر ڤۆڵت پێوەر.

**voluble** (vol′yoo-b′l), *adj.* (۱) زمان پاراو؛ قسەزان؛ زمان ڕەوان؛ زۆربێژ (۲) [Rare]، خولاوە؛ سووڕاوە؛ بە ئاسانی دەخولێتەوە

(۳) تێوەئالاو، تەرز، پێچ خواردوو؛ لوول؛ لوول خواردوو

**-volubility** *(n.)*; **volubleness** *(n.)*; **volubly** *(adv.)*.

**volume** (vol′yoom), *n.* (۱) لوولە کاغەز؛ تۆپ (پێستی کاغەزی کۆن)؛ گوورزە (۲) (أ) پەرتووك؛ کتێب (ب) بەرگ *(a dictionary of two ~s)*.

(۳) قەوارە؛ قەبارە، گەورەوبچووکی.

(٤) بارستایی بڕێکی ئێجگار زۆر *(a ~ of mail; ~s of abuse)*.

(٥) بەرزی دەنگ؛ زڵی دەنگ *(Please turn down the ~.)*.

(٦) پڕی دەنگ (مۆسیقا)

**speak volumes,** شتی زۆر گرنگ دەرخستن؛ شت زۆر پیشاندان؛ زۆر گرنگ *(His testimony spoke volumes.)*.

**volumeter** (və-loo′mə-tēr, və-lu′mə-tēr), *n.* قەبارەپێو شلە، گاز، شتی پتەو

**volumetric** (vol′yoo-met′rik), *adj.* قەبارەپێوی

**volumetric analysis,** شیکردنەوەی قەبارەیی (کیمیا)

**voluminous** (və-lōō′mə-nəs, və-lū′mə-nəs), *adj.* (۱) زل؛ بە قەبارە؛ پڕ؛ گەورە؛ قەبارەدار *(a ~ skirt)*.

(۲) (أ) پڕ چەند بەرگێك یا دەفتەرێك؛ زۆر؛ گەلێك؛ فرە:

*(He took ~ notes in class.)*

(ب) بە بەرهەم؛ زۆرنووس *(a ~ poet, writer, etc.)*.

(۳) [Archaic]، پێچاوپێچ *(a ~ labyrinth)*

**-voluminousity** *(n.)*; **voluminously** *(adv.)*;

**voluminousness** *(n.)*.

**voluntarily** (vol′ən-ter′ə-li), *adv.* بە خۆشی خۆ؛ بە خواستی خۆ؛ بە ئارەزووی خۆ؛ بە هەوەسی خۆ.

**voluntarism** (vol′ən-tə-riz′m), *n.* (۱) خۆویستەنێتی؛ خۆکردەنێتی (۲) فەلسەفەی خۆویستەنی؛ بیروباوەڕێکە کە دەڵێت بنچینەی سەرەکی جیهان کاری خۆویستەنی یا خۆکردەنییە.

**-voluntarist** *(n.)*; **voluntaristic** *(adj.)*.

**voluntary** (vol′ən-ter′i), *adj.* (۱) خۆویست؛ بە خۆشی خۆ کراو یا دراو؛ خۆکردە *(a ~ contribution, act, etc.)*.

(۲) دەسەنقەست؛ بە ڕێکەوت نەکراو *(~ manslaughter)*.

(۳) جڵەوی بە دەست خۆیەتی؛ خاوەنی ڕاو بڕیاری خۆیەتی؛ خۆکار

*(Man is a ~ agent.)*

(٤) بە پیتاکی خەڵك دەچێت بەڕێوە نەك بە یارمەتی میری *(~ churches)*.

(٥) (أ) بە زۆر (پێ) نەکراو (ب) بۆ سوودێك یا مەبەستێك نەکراوە

*n.* (۱) کارێکی خۆویست؛ کارێکی خۆکردە نەك بە زۆر.

(۲) پارچەیەك مۆسیقایە بە "ئۆرگەن" لێدەدرێت لەپێش، لەکاتی، یا لەدوای نوێژدا لە کڵێسەدا

**voluntaryism** (vol′ən-ter′i-iz′m), *n.* کڵێسەو قوتابخانە بەڕێوەبردن بە پیتاك و یارمەتی خەڵك نەك بە پارەی میری.

**volunteer** (vol′ən-tēr′), *n.* (۱) خۆبەخش؛ خۆبەخشیو

(۲) کەسێکە کە بە خۆشی خۆی دەبێتە سەرباز (۳) ڕووەکی لەخۆوە ڕوواو

*adj.* (۱) خۆبەخش؛ لە کەسانی خۆبەخش پێکهاتوو *(a ~ army)*.

(۲) هی خۆبەخشان (۳) خۆویست؛ خۆکرد. (٤) لە خۆوە ڕوواو یا سەوزبوو

*v.t.* بە خۆشی خۆ دان یا بەخشین.

*v.i.* خۆبەخشین؛ بە خۆشی خۆ بوون بە سەرباز؛ بە خۆشی خۆ کردن.

**voluptuary** (və-lup′chōō-er′i), *n.* مرۆڤی خۆشی پەرست

*adj.* خۆشی پەرست.

**voluptuous** (və-lup′choo-əs), *adj.* (۱) خۆشی؛ پڕ لە خۆشی:

*(a ~ life)*

(۲) هی خۆشی هەستەکان *(~ pleasures)*.

(۳) هەستی *(~ desires)*.

(٤) جوان و پانوپۆڕ؛ هەوەس هەڵسێن؛ حەشەری؛ لە حەشەری چوو:

*(a ~ woman; a ~ mouth)*

(٥) دڵکەرەوە؛ دڵخۆشکەر *(~ beauty)*.

**-voluptuously** *(adv.)*; **voluptuousness** *(n.)*.

**volute** (və-lōōt′, və-lut′), *n.* (۱) نەخشی پێچ پێچۆکەی تەوقەسەری کۆڵەکەو پایەیەی یۆنانی کۆن (خانووسازی).

(۲) پێچ؛ شێوەیەکی پێچ پێچی (۳) پێچی لەپکە یا گوێچکەماسی

*adj.* لوول خواردوو؛ لوول؛ پێچ پێچ

**voluted** (və-loot′id, və-lūt′id), *adj.* (۱) پێچ پێچ؛ لوول خواردوو؛ لوول. (۲) نەخشی پێچ پێچ تیاکراو (خانووسازی).

**volution** (və-lōō′shən, və-lū′shən), *n.* (۱) خول؛ پێچ؛ سووڕ.

(۲) پێچی لەپکە یا گوێچکەماسی.

**volva** (vol′və), *n.* پەردەی بنی قارچکی ساواو کەروو.

**volvulus** (vol′vyoo-ləs), *n.* لەیەکترەوەئالانی ڕیخۆڵە؛ پێچ خواردنی ڕیخۆڵە.

**vomer** (vō′mēr), *n.* ئێسقانی دیواری نەبینی هەردوو کونە لووت.

**-vomerine** *(adj.)*.

**vomica** (vom′i-kə), *n.* (١) کیسی پڕ لە کێمی هەندێ ئەندامی نەخۆش بەتایبەتی سییەکان. (٢) کێمی ناو ئەم کیسە. (٣) بە کۆکە هێنانەوەی ئەم کێمو پیساییە.

**vomit** (vom′it), *n.* (١) ڕشانەوە (٢) ئەو شتەی لە ڕشانەوەدا دەهێنرێتەوە. (٣) دەرمانی ڕشانەوە.

*v.i.* (١) ڕشانەوە؛ هەڵهێنانەوە. (٢) فڕێدانە دەرەوە

*v.t.* (١) ڕشانەوە؛ هەڵهێنانەوە (٢) فڕێدانە دەرەوە

**vomitive** (vom′it-iv), *adj.* ڕشێنەرەوە؛ هەڵهێنەرەوە؛ ڕشانەوەیی

*n.* دەرمانی ڕشانەوە

**vomito** (vom′i-tō), *n.* (١) ڕەشە ڕشانەوەی زەردە تا (٢) زەردە تا

**vomitory** (vom′i-tôr′i. vom′i-tō′ri), *adj.* ڕشانەوەیی؛ ڕشێنەرەوە.

*n.* (١) دەرمانی ڕشانەوە. (٢) کون یا بۆری شت لێوە هاتنە دەرەوە. (٣) دەرگاو ڕاڕەوی شانۆی ڕۆمانی

**vomiturition** (vom′i-choo-rish′ən), *n.* هێڵنج دان؛ هێڵنجی بێ ڕشانەوە.

**von** (von), *prep.* [G.] ی؛ خەڵکی فلان شوێن: پێشگرێکی کەلی ئەڵمانی و نەمسایییە

**voodoo** (vōō′dōō), *n.* (١) ڤودوو. ئایینێکی قولەڕەشەکانی "هایتی" و ئەمەریکای ئاوەڕاستە لە بنەڕەتدا ئەفەریقییەو لەسەر جادووگەری بەندە؛ جادووگەری ڤوودوو. (٢) ڤوودوو پەرست؛ پەیڕەویکەری ڤوودوو. (٣) جادوو؛ نووشتەی ڤوودوو. (٤) جادووگەر؛ جادووباز؛ ئەفسونگەر.

*adj.* ڤوودوویی؛ تایبەتی بە ئاینو جادووبەندی ڤوودوو.

*v.t.* نوشتەی ڤوودوو لێکردن؛ جادوولێکردن.

**voodooism** (vōō′dōō-iz′m), *n.* ڤوودووییە. بیروباوەڕو نەریتی ڤوودوو (وشەی پێشوو ببینە).

-**voodooist** *(n.)*; voodooistic *(adj.)*.

**voracious** (vô-rā′shəs, vō-rā′shəs), *adj.* (١) چاوچنۆک؛ بخۆر؛ چاوبرسی؛ زۆرخۆر؛ ئەوسن. (٢) چاوبرسی؛ بەپەرۆش؛ تێرنەخۆر (مەجاز)؛ زۆر بەحەز؛ ئارەزوومەند: *( a ~ reader)*.

-**voraciously** *(adv.)*; voraciousness *(n.)*.

**voracity** (vō-ras′ə-ti, vō-ras′ə-ti), *n.* (١) چاوچنۆکی؛ ئەوسنی؛ زۆرخۆری؛ بخۆری. (٢) چاوبرسێتی؛ تێرنەخۆری (مەجاز)؛ حەزی زۆر؛ بەپەرۆشی

-**vorous** (vẽr-əs), پاشگرێکە بەمانای: خۆر؛ ئەو شتە دەخوات: *( omnivorous; carnivorous)*

**vortex** (vôr′teks), *n.* (١) گێژاو؛ گەرداو (٢) گەردەلوول؛ گێژەلووکە (٣) گێژاو. باروودۆخ، کاروبار؛ بارودۆخێکی گێژاوی

**vortical** (vôr′ti-k'l), *adj.* (١) گەرداوی؛ گێژاوی. (٢) گێژ خواردوو؛ خول خواردوو؛ خولاوە

**vorticella** (vôr′tə-sel′ə). *n.* زیندەوەرێکی ئاوی یەک شانەیییە لەشێکی زەنگوڵەیی هەیە بەسەر لاسکێکەوە کە خۆی پێوە دەنووسێنێت بە شتی دەوروپشتییەوە.

**vorticose** (vôr′tə-kōs′), *adj.* = vortical.

**vortiginous** (vôr-tij′ə-nəs), *adj.* (١) گێژ خواردوو؛ خولاوە؛ خول خواردوو (٢) مارپێچی؛ پێچ پێچی

**votaress** (vō′tə-ris), *n. fem. of* votary.

**votarist** (vō′tə-rist), *n.* = votary.

**votary** (vō′tə-ri), *n.* (١) پەرستار؛ ووشکە سۆفی؛ سۆفی؛ خواپەرست؛ کەسێکە کە سوێندی خواردووە هەر خواپەرستی بکات. (٢) (ا) پەرۆش؛ لایەنگر. (ب) سوختە (٣) کەسێکی خۆ تەرخان کردوو بۆ مەسەلەیەک، ئاینێک، ڕێبازێک.

*adj.* (١) سوێند لەسەر خوراو؛ پەیمان لەسەر دراو. (٢) بەڵێنی؛ پەیمانی.

**vote** (vōt), *n.* (١) دەنگ (هەڵبژاردن). (٢) بلیتی دەنگدان. (٣) مافی دەنگدان. (٤) (ا) هەموو ئەو دەنگانەی کە دراون: *( The ~ was light.)* (ب) دەنگ بەگشتی؛ ئەو دەنگانەی کە دەتوانرێ بدرێن: *( Get out the ~ .)* (٥) [Obs.]، voter . (٦) [Obs.]، پەیمان دان؛ سوێند خواردن. (٧) [Obs.]، نزا؛ نوێژ.

*v.i.* دەنگدان.

*v.t.* (١) دەنگ بۆ دان. (٢) پەسەندکردن: *( They ~ed new funds for the program.)* (٣) ڕا وابوون؛ ووتن؛ ڕا دەربڕین؛ ڕا دان: *( They ~ed the picnic a success.)* (٤) [Colloq.]، پێشنیازکردن.

cast a vote, دەنگدان.

vote down, دەنگ بۆ نەدان؛ ژێرخستن (بە دەنگ بۆ نەدان)؛ بەزاندن: *( The committee voted the proposal down.)*

vote in, هەڵبژاردن؛ دەنگ بۆ دانو هەڵبژاردن: *( The electorate voted the opposition party in.)*

vote out, هەڵنەبژاردنەوە؛ دەنگ بۆ نەدانەوەو بەزاندن یا ژێرخستن: *( The people voted the president out.)*

**voteless** (vōt′lis), *adj.* بێ مافی دەنگدان.

**voter** (vōt′ẽr), *n.* (١) دەنگدەر؛ هەڵبژێر. (٢) کەسێکە کە مافی دەنگدانی هەبێت.

**voting machine,** مەکینەی دەنگ ژماردن (هەڵبژاردن).

**votive** (vō′tiv), *adj.* (١) پەیمانی؛ بۆ هێنانەدی پەیمانێک یا سوێندێک پێشکەش کراوە: *( a ~ offering)* . (٢) خواستی؛ خواست یا حەز دەربڕ؛ نزایی: *( a ~ prayer)* .

**vouch** (vouch), *v.t.* (١) بەڵگە بۆ هێنانەوە؛ چەسپاندن بە بەڵگە؛ ساغ کردنەوە. (٢) بانگ کردن بۆ گەواهیدان لە دادگادا. (٣) [Archaic]، بە دڵنیایی ووتن؛ بەبێ گومانانە ووتن.

*v.i.* (١) ( ~ for ) ، دەستەبەری کردن؛ شایەتی بۆ دان (بۆ سەرڕاستی، باشی، بەتوانایی): *( His friends ~ed for his honesty.)* . (٢) ( ~ for )، بەڵگەبوون بۆ *( His past history ~ for his ability.)*

**voucher** (vouch′ẽr), *n.* (١) دەستەبەر؛ شایەت؛ لایەنگر. (٢) قەواڵە؛ سەنەد؛ بەڵگەنامە (قەرزدانەوە). (٣) شایەتی تاپۆ یا خاوەنێتی کەسێک بۆ خانوو و زەویوزارێک

**vouchsafe** (vouch-sāf′), *v.t.* بێزهاتن (وەڵامدانەوە، شت پێدان، ئاوڕلێدانەوە): *( to ~ a reply)* .

*v.i.* بێزهاتن.

-**vouchsafement** *(n.)*.

**voussoir** (vōō-swär′), *n.* خشت یا بەردی بەشە کەوانییەکەی تاق (خانووسازی).

**vow** (vou), *n.* (١) سوێندی خواپەرستی؛ پەیمانی ووشکەسۆفێتی: *( a nun's ~s)* (٢) پەیمان یا بەڵێنی ژنهێنانو شووکردن: *( marriage ~s)* . (٣) سوێند؛ پەیمان؛ بەڵێن.

*v.t.* (١) پەیمان دان؛ بەڵێن دان. (٢) سوێندخواردن: *( ~ing revenge on their persecutors)* . (٣) بە دڵ ووتن: *( Well, I ~ it is as fine a child as ever was seen.)*

*v.i.* (١) پەیمان دان؛ بەڵێن دان. (٢) سوێندخواردن.

-**vower** *(n.)*.

take vows, بوون بە پەرستار؛ بوون بە کەشیش.

**vowel** (vou′əl), *n.* (١) دەنگی تیپە بزوێن (دەنگناسی). (٢) تیپە بزوێن: ( a, i, e, o, u ) .

*adj.* تایبەتی بە تیپە بزوێن.

**vowelize** (vou′əl-īz′), *v.t.* سەروبۆر بۆکردن (زمانی عەرەبی).

-vowelization *(n.)*.
**vowel point,** سەروبۆر (زمانی عەرەبی).
**voyage** (voi′ij), *n.* (١) گەشتی دەریایی (بە تایبەتی هی دوور).
(٢) گەشتی هەوایی؛ گەشتی فڕۆکە.
(٣) گەشتنامەی دەریایی.
*v.i.* چوون بۆ گەشتی دەریایی؛ گەشتی دەریایی کردن.
*v.t.* دەریا بڕین لە گەشتدا.
**voyager** (voi′ij-ēr), *n.* (١) گەشتکەری دەریایی.
(٢) گەشتکەر؛ ڕێبوار.
**voyageur** (vwä′yä′zhër′), *n.* [Fr.], (١) ڕێبوار
(٢) (أ) بەلەمەوانێکە کە فەروەو شتومەك دەگوێزێتەوە لەنێوان شوێنە چەپەکاندا لە ڕوژئاوای کەنەداو ڕۆژئاوای سەرووی ئەمەریکا بۆ کۆمپانیاکانی فەروە.
(ب) بەلەمەوان یا دارستانەوانی ڕۆژئاوای کەنەدا.
**voyeur** (vwä-yūr′), *n.* سەرەتاتکێکەر (بەتایبەتی کەسێکە کە خۆشی لەوە دەبینێ کە بە دزییەوە سەیری دەستبازیو جووت بوونو کێرو قوزی خەڵك بکات) (هەروەها " peeping Tom " ببینە).
-voyeuristic *(adj.)*; voyeuristically *(adv.)*.
**voyeurism** (vwä-yūr′iz'm), *n.* سەرەتاتکێ کردن (بەتایبەتی خۆشی وەرگرتن لە بە دزییەوە سەیرکردنی دەستبازیو جووت بوونو کێرو قوزی خەڵك)
**V.P.,** = Vice-President.
**V sign,** *n.* نیشانەی سەرکەوتن (کە بە پەنجەی ناوەڕاستو دۆشاومژە دەکرێت وەك " V ").
**v.t.** = transitive verb.
**vug, vugg, vugh** (vug, voog), *n.* بۆشایی ناو بەردێك یا دەمارێکی کانزایییە کە گەلێك جار بە بلوور گیراوە (کانزاکردن).
-vuggy *(adj.)*.
**Vulcan** (vul′kən), *n.* ڤۆلکان: خوای ئاگرو دروستکردنی ئامێرو دەفری کانزایی (ئەفسانەی ڕۆمانی).
**Vulcanian** (vul-kā′ni-ən), *adj.* (١) ڤۆلکانی (ووشەی پێشوو- ببینە). (٢) [v-]، تایبەتی بە دروستکردنی ئامێرو دەفری کانزایی.
(٢) [v-]، ئاگرپژێنی؛ بورکانی.
**vulcanite** (vul′kən-īt′), *n.* ڤۆلکانێت: لاستیکی سەخت بە جۆشدان لەگەڵ گۆگرددا دروست دەکرێت (شانەو شتی وەهای لێ دروست دەکرێت).
**vulcanize** (vul′kən-īz′), *v.t.* (١) سەخت کردنی لاستیك بە جۆشدانی بە گۆگردەوە. (٢) سەخت کردنی ماددەی تر بە هەمان شێوە.
*v.i.* سەخت بوون بە جۆشدان بە گۆگردەوە.
-vulcanization *(n.)*; vulcanizer *(n.)*.
**vulcanology** (vul′kən-ol′ə-ji), *n.* = volcanology.
**vulgar** (vul′gēr), *adj.* (١) هی ڕەش‌وڕووت؛ هی خەڵکی سادە:
*( ~ life; the ~ herd)*
(٢) باو؛ بڵاو؛ گشتی: *( ~ errors)*.
(٣) ڕەشۆکی؛ بازاڕی.
(٤) هی زمانی دووان؛ هی زمانی ئاسایی یا پەتی: *( the ~ tongue)*.
(٥) ناشرین (زمان، ڕەووشت،... هتد)؛ نزم؛ سووك؛ پیس:
*( ~ language, behavior, tastes, jokes, etc.)*
*n.* (١) هەرچی‌وپەرچی؛ چینی ڕەش‌وڕووت.
(٢) [Obs.]، زمانی ئاسایی ناوچەیەك یا وڵاتێك؛ زمانی پەتی.
-vulgarly *(adv.)*; vulgarness *(n.)*.
**vulgar era, the** = Chrisitian era.
**vulgar fraction** = common fraction.
**vulgarian** (vul-gâr′i-ən), *n.* کەسێکی بازاڕی (بەتایبەتی دەوڵەمەندێکی نەزان کە خۆی بابدات بە سامانەکەیەوە).
**vulgarism** (vul′gēr-iz'm), *n.* (١) ووشە یا ووتەی بازاڕی (بەتایبەتی لە زمانی دوواندا). (٢) vulgarity.

**vulgarity** (vul-gar′ə-ti), *n.* (١) بازاڕێتی؛ ڕەشۆکێتی
(٢) کردەوەو ڕەووشتو ووتەی سووكو ناشرین.
**vulgarize** (vul′gēr-īz′), *v.t.* (١) نزم کردنەوە (ڕەووشت)؛ سووك کردن؛ بێ بایەخ کردن: *( to ~ standards of etiquette)*.
(٢) ئاسان کردن (شتێکی گران تاوەکو هەموو کەس تێی بگات)
-vulgarization *(n.)*; vulgarizer *(n.)*.
**Vulgar Latin,** لاتینی دوواندن؛ زمانی لاتینی ئاسایی نەك وێژەو نووسین.
**Vulgate** (vul′gāt, vul′git), *n.* (١) ئینجیلی وەرگێڕاو بۆ لاتینی بڕواپێکراوو بەکارهێنراو لەلایەن کڵێسەی کاسۆلیکییەوە.
(٢) [v-]، دەقی نووسراو یا کتێبێکی لەلایەن جەماوەری خەڵکەوە بەکارهێنراو.
*adj.* (١) تایبەتی بە ئینجیلی وەرگێڕاو بۆ لاتینیو لەلایەن کڵێسەی کاسۆلیکییەوە بڕواپێکراو. (٢) [v-]، ڕەمەکی؛ جەماوەری؛ ئاسایی؛ بەباو لەناو خەڵکدا.
**vulnerability** (vul′nēr-ə-bil′ə-ti), *n.* (١) بە ئاسانی ئازاردراو.
(٢) لاوازی؛ ناسکی؛ بە ئاسانی کارتێکران.
(٣) بە ئاسانی گیران (سەنگەر)؛ نەپارێزراوی.
**vulnerable** (vul′nēr-ə-b'l), *adj.* (١) بە ئاسانی برینداردەبێ یا ئازاری دەبێ: *( a ~ part of the body)*.
(٢) (أ) بە ئاسانی کاری تێ دەکرێ؛ ڕەخنەی لێ دەگیرێ؛ شلۆق
*( a ~ reputation; ~ to criticism, ~ to bribery)*
(ب) لاواز؛ ناسك.
(٣) بە ئاسانی دەگیرێ (شار، سەنگەر)؛ نەپارێزراو:
*( a ~ position, town, military outpost, etc.)*
-vulnerableness *(n.)*; vulnerably *(adv.)*.
**vulnerary** (vul′nēr-er′i), *adj.* برین پێ تیمارکراو.
*n.* دەرمانی تیمارکردن؛ چارەی برین.
**vulpine** (vul′pīn, vul′pin), *adj.* (١) ڕێوی؛ لە ڕێوی دەچێ.
(٢) فێڵباز.
**vulture** (vul′chēr), *n.* (١) سیسارك؛ سیسارکە کەچەڵە.
(٢) کەسێکی چاوبرسی دڕندە.
**vulturine** (vul′chēr-īn′, vul′chēr-in), *adj.* (١) سیسارکی؛ لە سیسارکە کەچەڵەو توخمەکەی دەچێ. (٢) چاوبرسیو دڕندە؛ تالانکەر؛ نێچیرکوژ: *( ~ lawyers, doctors, salesmen, etc.)*.
**vulturous** (vul′chēr-əs), *adj.* = vulturine.
**vulva** (vul′və), *n.* زێ؛ قوز؛ دەمو لێوی قوز
-vulval; vulvar; vulvate *(adj.)*.
**vulviform** (vul′və-fôrm′), *adj.* لە زێ دەچێ؛ وەك قوز وایە.
**vulvitis** (vul′vi-tīs′), *n.* هەوکردن یا سووتانەوەی دەمو لێوی قوز.
**vulvovaginitis,** هەوکردن یا سووتانەوەی قوزو دەمو لێوەکەی.
**vying** (vi′iŋ), *adj.* پێشبڕکێکەر؛ ملەملکەر؛ بۆڕبۆڕێنکەر.
-vyingly *(adv.)*.



**W, w** (dub'l-yoo), *n.* (١) تیپی بیست و سێیەمی ئەلفوبێی ئینگلیزییە. (٢) دەنگی ئەم تیپە: " دەبڵ یو "
(٣) (أ) قاڵبی ئەم تیپە (ب) ئەم تیپە بە چاپکراوی یا هەڵکەنراوی.
(٤) بیست و سێیەم: نیشانەی ژمارە بیست و سێیەمی ڕستەیەکە.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی " W " (٢) بیست و سێیەم
**wabble** (wäb'l), *n., v.i. & v.t.* = wobble.
**wabbly** (wäb'li), *adj.* wobbly.
**wack** (wak), *n.* [Slang]. کەسێکی شێتۆکە یا سەیر.
**wacko** (wak'ō), *n.* [Slang]. کەسێکی شێتۆکە یا سەیر
**wacky** (wak'i), *adj.* [Slang]. *Also* **whacky**, شێتۆکە؛ سەیر؛ شێت
**wad** (wäd, wôd), *n.* (١) تۆپەڵی پەستراوە
***( a ~ of chewing tobacco, paper, etc.)***
(٢) ناواخن (٣) دەمەوانەیەکی بچووکی قوماش یا مقەبایە دەمی لوولەی تفەنگی کۆن و فیشەکی پێ دەگیرێ بۆ ڕاگرتنی بارووتەکە لە جێی خۆیدا.
(٤) دەستە پارەی کاغەز؛ سەفتە: ***( a ~ of ten-dollar bills)*** .
(٥) [Slang]. پارەی زۆر؛ سامانی زۆر
(٦) [British Dial.]. گورزە؛ قول (پووش، گزرە)؛ مەلۆ.
***v.t.*** (١) پەستنەوە و تۆپەڵ کردن (٢) لوول کردن (کاغەز، پارەی کاغەز)؛ دەستەکردن (٣) دەمی کون گرتن (بە تۆپەڵە قوماش یا کاغەز).
(٤) ناواخن تێخستن؛ بەر تێگرتن (چاکەت، جل)؛ ناخنین
(٥) دەمی لوولەی تفەنگی کۆن و فیشەک گرتن بە دەمەوانە
***v.i.*** تۆپەڵ بوون
**wadding** (wäd'iŋ, wôd'iŋ), *n.* (١) ناواخن بەری چاکەت و جلی تر
(٢) قوماش یا مقەبای بەکارهێنراو بۆ دەمەوانەی لوولەی تفەنگی کۆن و فیشەک.
**waddle** (wäd'l, wôd'l), *v.i.* بە خلەخل ڕۆیشتن (وەک مراوی و منداڵی تازە پێ گرتوو)؛ گەلاوگەل ڕۆیشتن.
***n.*** بە خلەخل ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتنی گەلاوگەل
**waddy** (wäd'i), *n.* دارێکی ئەستووری نووک تیژە وەک گورز خەڵکە دەشتەکییە کۆنەکانی ئوسترالیا وەک چەک بەکاریان دەهێنا.
***v.t.*** تێگرتنی ئەم دارە؛ لێدان بەم دارە
**waddy** (wäd'i), *n.* (١) cowboy (٢) دزی ڕەشەووڵاخ
**wade** (wād), *v.i.* (١) پێدا ڕۆیشتن بە پێ (تەنکاو، قوڕولیتە، بەفر، لم، گیای هەرز) (٢) خۆ بەکێش کردن؛ بە زەحمەت پێدا ڕۆیشتن
***( to ~ through a dull book)***
(٣) [Obs.]. ڕۆیشتن؛ تێپەڕبوون.
***v.t.*** لە ناو دان؛ لێ پەڕینەوە: ***( to ~ the brook)*** .
***n.*** (١) پێدا ڕۆیشتن؛ پەڕینەوە. (٢) بوار؛ شوێنی لە ناو پەڕینەوە.
**wade in ( or into ), [Colloq.],** دەستپێکردنی کارێک بە هەموو هێزو توانایەکەوە؛ بە توندی هێرش بردنە سەر:
***( to wade into a mob of rioters)***
**wader** (wād'ẽr), *n.* (١) پێدا ڕۆیشتوو (تەنکاو، قوڕولیتە... هتد).
(٢) باڵندەی بە ناودا ڕۆیشتوو: باڵندەی لاق درێژی کەنار دەریا و ناو زەلکاو وەک: شینە شاهۆ و قولنگ و چۆلەکەی لم. (هەروەها " wading bird ").
(٣) (*pl.*) جزمەی درێژ یا پانتۆڵی ناودانەدەر (ڕاوکەری ماسی لە پێی دەکەن)
**wadi** (wä'di), *n. Also* **wady,** دۆڵ؛ شیو؛ چەم.
**wading bird,** باڵندەی بە ناودا ڕۆیشتوو: باڵندەی لاق درێژی کەنار دەریا و ناو زەلکاو وەک: شینە شاهۆ و قولنگ و چۆلەکەی لم... هتد (هەروەها " wader ").
**wading pool,** گۆماوی تەنکاو بۆ منداڵان (جێگیر یا جوولاو).
**wadmal** (wäd'mal), *n. Also* **wadmaal, wadmol,** قوماشێکی خوری زۆر ئەستوور و قایمە
**wadset** (wäd'set'), *n. & v.t.* خانوو زەوی‌وزار کردن بە بارمتەی قەرز.
**wafer** (wā'fẽr), *n.* (١) پارچە پسکیتی تەنک
(٢) پارچەیەک شیرینی یا نوقوڵی تەنک.
(٣) پارچەیەک شتی تەنک (وەک دەرمان).
(٤) پەنچکە نانە ڕەقەی شێوی خودایی (کڵێسەی کاسۆلیکی)
(٥) مۆر. خەپلەیەک یا پینەیەکی ماددەیەکی سرنشاوییە بەڵگەنامە و نامەی پێ مۆر (لۆک) دەکرێ و پێوەی ووشک دەبێتەوە؛ لۆک.
(٦) ئەڵقە یا خەپلەیەکی تەنکە وەک دەمەوانە بەکاردەهێنرێ.
**waff** (waf, wäf), *n.* [Scot. & British Dial.]. (١) دەست ڕاوەشان؛ شەکانەوە. (٢) سروە؛ هەڵکردنێکی با
(٣) سەرنج؛ سەیرکردنێکی کەم. (٤) خێو.
*v.t. & v.i.* شەکاندنەوە؛ دەست ڕاوەشاندن.
**waff** (waf, wäf), *adj.* [Scot.]. (١) هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ.
(٢) تەنیا؛ بێ کەس
*n.* کەسێکی بێ لانە؛ خانە بە کۆڵ؛ گەڕۆک؛ دەربەدەر؛ ئاوارە.
**waffle** (wäf'l, wôf'l), *n.* وافل: کێکێکی تەنکە وەک شلکێنە بەڵام نەخشدارە و باش دەبرژێنرێ بۆ بەرچایی.
**waffle** (wäf'l, wôf'l), *v.i.* (١) وەڵام نەدان بە دەستەوە؛ منجەمنج کردن و خۆدزینەوە لە وەڵامی ڕاستەوخۆ:
***( The director ~d on this issue.)***
(٢) نزرویژی کردن: شتی هیچ‌وپووچ نووسین یا ووتن؛ درێژە پێدان
*n.* قسەی هیچ‌وپووچ؛ نزرویژی
**waffle iron,** ئامێرێکی ئاسنی پەل دوو پەرەیە دیوی ناوەوەی نەخشی تێدایە گیراوەی کێکی " وافل " دەکرێتە نێوان هەردوو پەرەکەیەوە و دەیبرژێنێ
**waft** (waft, wäft), *v.t.* (١) بە هێواشی بردن یا هەڵگرتن (بەسەر ئاودا یا بەناو هەوادا)؛ پاڵ پێوەنان بەم جۆرە؛ گواستنەوە
(٢) [Obs.]. بانگ کردن بە دەست (٣) [Obs.]. چاو وەرگێڕان
*v.i.* (١) سەر هەوا یا ئاو کەوتن؛ بە هەوادا هاتن (بۆن، دەنگ،... هتد).
(٢) بە هێواشی هەڵکردن (با)؛ هاتن (سروە).
*n.* (١) سەر هەوا یا ئاو کەوتن (٢) بۆنێک یا دەنگێک کە هەوا بیهێنێ
(٣) سروە (٤) شەکانەوە؛ ڕاوەشان
(٥) ئاڵای لێقەومان: ئاڵایەکە هەڵدەکرێت بەسەر کەشتی یا بەلەمی لێقەوماوەوە بۆ داواکردنی یارمەتی (هەروەها " waif ").
**waftage** (waf'tij, wäf'tij), *n.* [Archaic]. سەر هەوا یا ئاو کەوتن؛ هەڵگرتن و بردن بە هەوا یا ئاودا
**wafture** (waf'chẽr, wäf'chẽr), *n.* (١) شەکاندنەوە؛ ڕاوەشان
(٢) شتێکی بە هەواوە هێنراو یا هاتوو (بۆن، دەنگ)
**wag** (wag), *v.t.* (١) لەقاندن (کلک، سەر)؛ ڕاوەشاندن (پەنجە)؛

باداین (کلك): ***(The dog is ~ging its tail.)***.

(٢) بادان (زمان)؛ هێنان و بردن.

***v.i.*** (١) (أ) لەقان (کلك، سەر)؛ ڕاوەشان: ***(The tail is ~ging.)***.

(ب) هەمیشە لە جم‌وجووڵدا بوون؛ ڕانەوەستان.

(٢) بادان (زمان)؛ بەدگۆیی کردن؛ کەوتنە قسەی خراپ:

***(Scandal caused tongues to ~.)***

(٣) لەسەر ڕێبازی خۆ ڕۆیشتن؛ بەردەوام بوون لەسەر ڕێی خۆ:

***(That's the way the world ~s.)***

(٤) بە خلەخل ڕۆیشتن (وەك مراوی یا منداڵی تازە پێ گرتوو)؛ گەلاوگەل ڕۆیشتن.

(٥) [British Colloq.]، ڕۆیشتن؛ کەوتنە ڕێ.

(٦) [British Slang]، خۆ دزینەوە لە قوتابخانە.

***n.*** لەقان (کلك، سەر)؛ ڕاوەشان؛ بادان: ***(the ~ of a dog's tail)***.

**wag** (wag), ***n.*** کەسێکی قۆشمە یا گاڵتەچی.

**wage** (wāj), ***v.t.*** (١) بەرپاکردن (جەنگ)؛ جەنگان؛ نانەوە (شەڕ)؛ هەڵگیرسان؛ گێڕان؛ کردن؛ پێ هەڵسان:

***(to ~ war against; to ~ a campaign)***

(٢) [Obs.]، بارمتەکردن؛ بەڵێندان.

(٣) [Obs.]، گرەوکردن.

(٤) [Obs. or British Dial.]، بە کرێ گرتن

***v.t.*** [Obs.], جەنگان؛ شەڕکردن.

***n.*** (١) (*pl.*) کرێ؛ ڕۆژانە.

(٢) (*pl.*) پاداشت؛ ئاکام؛ ئەنجام: ***(For the ~s of sin is death.)***.

(٣) [Obs.]، (أ) بارمتە؛ بەڵێن (ب) لە بارمتەدا بوون.

**wage earner,** (١) کرێکار (٢) کەسێکە کە بە ڕۆژانە خێزانەکەی دەژێنێ.

**wager** (wā'jēr), ***n.*** گرەو

***v.t. & v.i.*** گرەوکردن.

**wage scale,** خشتەی کرێی ئیشی جۆراوجۆری کارگەیەك یا کۆمپانیایەك

**wage-worker** (wāj'wûr'kēr), ***n.*** = **wage earner.**

**waggery** (wag'ēr-i), ***n.*** (١) گاڵتەچێتی؛ گاڵتەبازی؛ قۆشمەچێتی؛ پەنگ دار (٢) تەشقەلە؛ پەنگ؛ گاڵتە؛ یاری.

**waggish** (wag'ish), ***adj.*** (١) بۆ کەسێکی قۆشمەچی یا تەشقەڵەباز دەشێت (٢) قۆشمە؛ پێکەنیناوی؛ بۆ گاڵتە کراو.

**waggle** (wag''l), ***v.t.*** ڕاوەشاندن؛ لەراندنەوە؛ لەقاندن.

***(She ~d her foot impatiently.)***

***v.i.*** بە لارەولار ڕۆیشتن؛ بە خلەخل ڕۆیشتن؛ گەلاوگەل کردن؛ لەتردان.

***n.*** (١) ڕاوەشان؛ لەرەلەر؛ لەقین؛ هاتن‌وچوون.

(٢) هێنان و بردنی گورزی گۆڵف بەسەر تۆپەکەدا لە پێش لێدانیدا.

**-waggly** ***(adj.).***

**wagon** (wag'ən), ***n.*** *Also* **waggon,** [British Spelling]. (١) گالیسکەی بار: گالیسکەیەکی باری درێژی سەرگیراوی چوارپێچکەییە؛ واگۆن (٢) **station wagon**.

(٣) [British]، فارگۆنی سەر کراوەی شەمەندەفەری بار.

(٤) ئۆتۆمبیلی بەند گواستنەوە بۆ بەندیخانە (هەروەها " **the wagon** " و " **police (or patrol) wagon** ").

(٥) واگۆنی بچووکی چوارپێچکەی یاری منداڵان

(٦) مێزێکی بچووکی پێچکەدارە (بۆ ساردەمەنی و خواردن پێشکەش کردن):

***(a dessert ~)***

(٧) [Obs.]، **chariot**.

(٨) [W-]، **the Big Dipper**.

***v.t.*** بە گالیسکە گواستنەوە؛ بە گالیسکە هەڵگرتن

***v.i.*** بە گالیسکە هاتوچۆکردن

**hitch one's wagon to a star,** چاو لە ئامانجێکی بەرز بوون؛ بۆ ئامانجێکی بەرز هەوڵدان

**off the wagon,** [Slang], دەستکردنەوە بە عەرەق خواردنەوە.

**on the (water) wagon,** [Slang], وازهێنان لە عەرەق خواردنەوە.

**wagonage** (wag'ən-ij), ***n.*** (١) بە گالیسکە یا واگۆن گواستنەوە.

(٢) کرێی ئەم گواستنەوەیە.

(٣) گالیسکە بەگشتی؛ کۆمەڵێك گالیسکە.

**wagoner** (wag'ən-ēr), ***n.*** (١) گالیسکەچی؛ عەرەبانچی؛ واگۆنچی.

(٢) [Obs.]، **charioteer**. (٣) [W-]، **the Big Dipper**

**wagonette** (wag'ən-et'), ***n.*** گالیسکەی بچووکی سواربوون.

**wagon-lit** (vå'gōn'lē'), ***n.*** [Fr.], فارگۆنی نووستنی شەمەندەفەر.

**wagon-load** (wag'ən-lōd'), ***n.*** پڕ گالیسکەیەکی بار؛ باری گالیسکەیەك.

**wagon train,** کاروانی گالیسکە (بەتایبەتی بۆ گواستنەوەی ئازووقەی سوپا).

**wag-tail** (wag'tāl'), ***n.*** کلك هەڵسەنگێنە

**wahoo** (wä-hōō', wä'hōō), ***n.*** دەوەنێکە گوڵی ئەرخەوانی و بەری سوور دەگرێ

**wahoo** (wä-hōō', wä'hōō), ***n.*** درەختێکی ئەمەریکییە لە توخمی ڕەشەدار.

**wahoo** (wä-hōō', wä'hōō), ***n.*** جۆرە ماسییەکی ناوچە گەرمەکانە.

**wahoo** (wä-hōō', wä'hōō), ***interj.*** واهوو!؛ قریوەی خۆشییە

**waif** (wāf), ***n.*** (١) شتی دۆزراوەی بێ خاوەن؛ شتی وون بووی بێ خاوەن.

(٢) منداڵی بێ خاوەن؛ هەتیو؛ منداڵی بەجێهێڵراوی بێ لانە؛ منداڵی ئاوارە.

(٣) گیانەوەری وون بوو یا بەرەڵا؛ بەچکە گیانەوەری بێ خاوەن.

(٤) شتی دزراوی لەسەر ڕێگە فڕێدراو لەلایەن دزی ڕاکردووەوە.

**waif** (wāf), ***n.*** = **waft # 3.**

**wail** (wal), ***v.i.*** (١) شین کردن؛ شیوەن کردن؛ لاوانەوە؛ بە کوڵ گریان؛ ناڵین؛ ناڵاندن ***(They ~ed.)***

(٢) لووراندن؛ لوورەلوورهاتن؛ لوورەلوورکردن: ***(The wind ~s.)***.

***v.t.*** (١) شین بۆ کردن؛ بە کوڵ بۆ گریان؛ بۆ لاوانەوە:

***(They ~ed his death.)***

(٢) ناڵاندن؛ ناڵین؛ شیوەن کردن.

***n.*** (١) شیوەن؛ شین؛ ناڵە؛ ناڵین؛ لاوانەوە.

(٢) دەنگی لاوانەوە؛ دەنگی شیوەن؛ ناڵە.

**-wailer** ***(n.)*; wailingly *(adv.).***

**wailful** (wāl'fəl), ***adj.*** (١) غەمبار. (٢) گریاو؛ شیوەن کردوو.

**Wailing Wall,** دیواری گریان: شوێنێکی پیرۆزە لای جوولەکە لە شاری (قودس).

**wailsome** (wāl'səm), ***adj.*** [Archaic], **wailful.**

**wain** (wān), ***n.*** [Archaic], (١) گالیسکە یا ئۆتۆمبیلی گەورەو سەر کراوەی کێڵگە (٢) [W-]، **the Big Dipper**.

**wainscot** (wān'skət, wān'skot'), ***n.*** (١) تەختەپۆشی دیوی ناوەوەی دیواری ژوور. (٢) تەختەپۆشی لاخوارووی دیواری ژوور.

(٣) (أ) لاخوارووی دیواری ژوور کە بە جیا نەخشێنراوە لەوی تری.

(ب) کاشی و تەختە یا شتی تری لاخوارووی دیوار پێ نەخشێنراو.

(٤) [British]، تەختەداری بەرووی ئایاب (بۆ تەختەپۆشی).

***v.t.*** دیوار تەختەپۆش کردن؛ بە کاشی یا تەختە لاخوارووی دیوار نەخشاندن

**wainscoting, wainscoting** (wān'skət-iŋ), ***n.*** (١) دیواری تەختەپۆش کراو (٢) تەختەداری ئەم تەختەپۆشییە

**wain-wright** (wān'rīt'), ***n.*** گالیسکەساز؛ واگۆن درووستکەر و چاکەرەوە.

**waist** (wāst), ***n.*** (١) کەمەر؛ ناوقەد؛ پشتێنە؛ تەنگە.

(٢) (أ) ئەو بەشەی جل کە ناوقەد دادەپۆشێ. (ب) سوخمە؛ یەلەك

(ج) بلووس یا کراسی هەتا ناوقەد هاتووی ئافرەت

(د) فانیلەی ژێرەوەی منداڵ

(٣) ناوقەدی شت، واتە بەشە بارێکەکەی

*( the ~ of a violin, shoe, etc.)*
(٤) ناوقەدی کەشتی
(٥) ناوقەدی هەندێك جانەوەر (وەك: مێروولە، زەردەواڵە، زەردەزیرە... هتد).
**waistband** (wāst′band′), *n.* کەمەربەند؛ پشتێن؛ قایشی پشت (بەتایبەتی کە لەسەر جلەوە بێت).
**waistcloth** (wāst′klôth′), *n.* = **loincloth.**
**waistcoat** (wāst′kōt′, wes′kət), *n.* (١) یەلەك (٢) سوخمە.
**waist-high** (wāst′hī′), *adj.* تا ناوقەد هاتوو؛ تا ناوقەد بەرزە.
**waistline** (wāst′līn′), *n.* (١) ناوقەد؛ کەمەر؛ پشتێنە
(٢) قەفی ناوقەد؛ کەمەرە؛ ناوقەد.
**wait** (wāt), *v.i.* (١) چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕوان کردن؛ ڕاوەستان
*( W~ until we call. W~ for us.)*
(٢) ئامادەبوون *( Dinner is ~ing for us.)*
(٣) ڕاوەستان؛ وەستان؛ دواخران: *( That work will have to ~ .)* .
(٤) بەردەستی کردن: *( She will ~ at table.)* .
*v.t.* (١) چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕوان کردن: *( W~ your turn.)* .
(٢) بەردەستی کردن: *( He ~s table.)* .
(٣) [Colloq.]، دواخستن (ژەمی خواردن): *( W~ dinner.)* .
(٤) [Obs.]، هاودەمی کردن (لەڕووی ڕێزەوە)؛ لەگەڵدا بوون؛ لە تەکدا چوون.
(٥) [Obs.]، ئەنجام لێ بوونەوە.
*n.* (١) چاوەڕێ؛ چاوەڕوان؛ چاوەڕێ کردن: *( We had a long ~ .)* .
(٢) ماوەی چاوەڕێ کردن.
(٣) بۆسە؛ داو. *( to lie in ~ )* .
(٤) ئەندامی تیپێکی مۆسیقا و گۆرانی کە لە کریسمەسدا دەگەڕێن و مۆسیقا لێدەدەن و گۆرانی کریسمەس دەڵێن (لە ئینگلتەرە).
(٥) [Obs.]، پاسەوان؛ حەسحەس؛ ئێشکچی؛ ئێشکگر
**wait on ( or upon ),** (١) بەردەستی کردن؛ نۆکەری کردن.
(٢) چوونە لای سەرگەورەیەك (بۆ ڕێز پیشاندان یا داواکردنێك)
(٣) ئەنجام لێ بوونەوە.
(٤) شت بۆ کڕیار هێنان یا پێشکەش کردن (لە فرۆشگا یا چێشتخانەدا)؛ بەردەستی کردن *( to wait on customers at a store)*
**wait out,** چاوەڕێی دوایی هاتن کردن؛ چاوەڕێ کردنی کۆتایی شتێك:
*( They waited out the war.)*
**wait up,** (١) نەنوستن لەبەر چاوەڕێ کردنی شتێك یا کەسێك
(٢) ڕاوەستان بۆ پێ گەیشتنەوەی کەسێکی دواکەوتوو.
**wait-a-bit** (wāt′ə-bit′), *n.* ڕووەکێکی دڕك تیژو چەماوەیە پێتەوە دەنووسێت
**waiter** (wāt′ēr), *n.* (١) بەردەست (چێشتخانە)؛ بۆی.
(٢) سینی (بۆ خواردەمەنی و خواردنەوە پێشکەش کردن)
(٣) [Obs.]، ئێشکچی؛ ئێشکگر؛ پاسەوان؛ حەسحەس.
**waiting** (wāt′iŋ), *adj.* (١) چاوەڕێکەر؛ هی چاوەڕێ کردن.
(٢) هی بەردەستی
*n.* (١) چاوەڕێ کردن؛ چاوەڕوان کردن. (٢) ماوەی چاوەڕێ کردن
**in waiting,** خەریکی بەردەستییە (بەتایبەتی هی پاشاو ژنە پاشاو کەسێکی گەورە)؛ بەردەستی دەکات؛ کارەکەری دەکات:
*( a lady-in-waiting)*
**waiting game,** پیلانی چاوەڕێ کردن. هیچ نەکردن و چاوەڕێ کردنی هەلێکی باشر بۆ دەست وەشاندن (ناکۆکی، ملەملێ، یاری... هتد).
**waiting list,** لیستەی چاوەڕێ. لیستەی چاوەڕێکەران (بۆ ئیش دەسکەوتن. شت وەرگرتن، دیدەنی، نۆرە هاتن... هتد).
**waiting room,** ژووری چاوەڕێ کردن (فەرمانگەی پزیشك، نەخۆشخانە. ئێستگەی پاس و شەمەندەفەر... هتد)
**waitress** (wāt′ris), *n.* ئافرەتی بەردەست (چێشتخانە، مەیخانە).
**waive** (wāv), *v.t.* (١) وازلێهێنان (لە مافێك یا داواکارییەك)؛ دەست لێ هەڵگرتن (٢) داوا نەکردن؛ سوور نەبوون لەسەر؛ بەخشین.
(٣) دواخستن.
(٤) خستنەلاوە؛ گوێ پێ نەدان: *( to ~ formalities)* .
(٥) [Obs.]، بەجێهێشتن؛ نەویستن؛ دەست لێ بەردار بوون.
**waiver** (wāv′ēr), *n.* (١) وازهێنان (لە ماف یا داواکارییەك)؛ دەست لێ هەڵگرتن. (٢) بڕوانامەی ئەم دەست لێ هەڵگرتنە یا وازهێنانە.
**wake** (wāk), *v.i.* (١) ( ~ **up** )، لە خەو هەڵسان؛ خەبەربوونەوە.
(٢) نەنوستن؛ بەخەربوون.
(٣) خەبەربوونەوە (مەجاز)؛ وریابوونەوە:
*( to ~ from one's daydreams)*
(٤) ئاگاداربوون؛ پێ زانین؛ ڕاستی بۆ دەرکەوتن:
*( to ~ to the true situation)*
(٥) [Dial. or Archaic]، ئێشکگرتنی مردوو هەتا کاتی ناشتنی.
*v.t.* (١) ( ~ **up** )، لە خەو هەڵساندن؛ خەبەرکردنەوە.
(٢) بزواندن؛ وریاکردنەوە؛ جووڵاندن (هەست).
(٣) [Archaic or Dial.]، ئێشکگرتنی مردوو هەتا کاتی ناشتنی.
*n.* (١) [Poetic] ، بەخەبەر بوون. (٢) (ا) ئێشکگرتنی شەونخوونی.
(ب) ئێشکگرتنی مردوو تا کاتی ناشتنی.
(٣) یادی ساڵانەی کردنەوەی کڵێسەیەك.
**wake** (wāk), *n.* (١) جێ نیشانی کەشتی یا بەلەم کە بە ئاودا دەڕوات:
*( the ~ of a ship)*
(٢) جێ نیشانی شتێکی تێپەڕیوو؛ ئەنجام یا پاشماوەی ڕووداوێك:
*( The war left a lot of devastation in its ~ .)*
**in the wake of,** (١) لە دواوەی کەشتی یا بەلەم.
(٢) دوابەدوای؛ یەکسەر لە پاش:
*( Traders came in the wake of the conquering armies.)*
(٣) لە ئەنجامی؛ لە ئەنجامدا.
**wakeful** (wāk′fəl), *adj.* (١) بەخەبەر؛ نەنوستوو.
(٢) وریا؛ بەئاگا. (٣) خەوزڕاو.
(٤) بێ خەو: *( a ~ night)* .
**-wakefully** *(adv.)*; **wakefulness** *(n.)*.
**wakeless** (wāk′lis), *adj.* شیرین (خەو)؛ قووڵ: *( ~ sleep)* .
**waken** (wāk′′n), *v.i.* (١) لە خەو هەڵسان؛ خەبەربوونەوە.
(٢) وریابوونەوە؛ ئاگاداربوونەوە؛ وورووژان.
*v.t.* (١) لە خەو هەڵساندن؛ خەبەرکردنەوە. (٢) وریاکردنەوە؛ وورووژاندن.
(٣) [Scot.]، پاسەوانی کردن.
**-wakener** *(n.)*.
**wakerife** (wāk′rīf′), *adj.* [Scot. & N. Eng. Dial.], = **wakeful.**
**wake-robin** (wāk′rob′in), *n.* (١) **trillium** .
(٢) چەند جۆرە ڕووەکێکن زوو لە بەهاردا گوڵ دەکەن.
**wake-up** (wāk′up′), *n.* دارکونکەرەی ئەمەریکی. (هەروەها " **flicker** ") .
**waldgrave** (wôld′grāv′), *n.* (١) سەرەك دارستانەوانی پاشایی (لە ئەڵمانیای کۆندا). (٢) خانەدانی ئەڵمانی؛ پلەو نازناوی خانەدانی ئەڵمانییە.
**wale** (wāl), *n.* (١) جێ نیشانی قامچی یا دار لێدان.
(٢) (ا) هێڵی قۆقز یا بەرزی قوماشی چنراو.
(ب) چۆنێتی چنینی ئەم قوماشە هێڵ هێڵە. (٣) داری پاڵپشت (پرد).
(٤) تووڵی چنراو بە دەوری بەرچنەو سەبەتەو زەمیلەدا بۆ قایمی.
(٥) تەختەدارێکە لە دارەکانی لاشەی کەشتی دەدرێ بۆ پێکەوەبەستنیان و قایم کردنیان.
*v.t.* (١) پێست شین و مۆرکردنەوەو هەڵ تلۆقاندن بە قامچی یا دار.
(٢) پاڵپشت کردن یا لێکدان بە تەختەدار یا بە شووڵ.
(٣) قوماش چنین بە جۆرێك کە هێڵی تێ بکەوێت.
**wale** (wāl), *n.* [Scot. & N. Eng. Dial.], (١) هەڵبژاردن.
(٢) هەڵبژاردە؛ شتی هەڵبژێردراو.
*v.t.* [Scot. & N. Eng. Dial.], هەڵبژاردن.

**walk** (wôk), *v.i.* (١) (أ) بە پێ ڕۆیشتن؛ بە ڕێگەدا ڕۆیشتن.
(ب) پیاسەکردن. (٢) دەرکەوتنی خێو؛ دەرکەوتن.
(٣) ڕێبازێکی تایبەتی گرتن؛ بە جۆرێکی تایبەتی ڕەفتارکردن:
*( Let us ~ in peace.)*
(٤) [Obs.]. هەمیشە جوولان؛ ڕانەوەستان؛ هەمیشە چالاکی نواندن.
*v.t.* (١) بە پێ پێدا ڕۆیشتن؛ پیاسە پێدا کردن؛ پێدا ڕۆیشتن؛ پێوان:
*( He is ~ing the deck.)*
(٢) بە پێ پێدا ڕۆیشتن بۆ پشکنین، پێوان، یا تاقیکردنەوە... هتد.
(٣) (أ) پیاسەپێکردن؛ لێخوڕین؛ بردن بۆ گەڕان بە پێ:
*( to ~ a horse, dog, etc.)*
(ب) مەشق پێکردن بە پێ.
(٤) لەگەڵ چوون بە پێ یا پیاسە: *( I'll ~ you to the corner.)*.
(٥) (أ) بە زۆر بە پێ بردن.
(ب) دەستی کەسێکی پەککەوتوو گرتن یا یارمەتیدانی بۆ ڕۆیشتن.
(٦) گەیاندنە دۆخێکی تایبەتی بە پێ ڕۆیشتن:
*( They ~ed me to exhaustion.)*
(٧) بە هەواشی بردن بەڕێوە.
***n.*** (١) بە پێ ڕۆیشتن؛ پیاسەکردن.
(٢) پیاسە: *( to take a ~ ; to go for a ~ )*.
(٣) جێی پیاسە؛ پیادە ڕێ: *( His usual ~ was along the river.)*.
(٤) ماوە یا دووری بە پێ ڕۆیشتن؛ کاتی بڕینی ماوەیەك بە پێ:
*( The town was an hour's ~ from us.)*
(٥) خێرایی ڕۆیشتن: *( The horse came home at a ~ .)*.
(٦) ڕەوت؛ شێوەی ڕۆیشتن: *( I knew her by her ~ .)*.
(٧) پلەی کۆمەڵایەتی؛ پیشە؛ پلەوپایە: *( people from all ~s of life)*.
(٨) ڕەووشت. کردەوە؛ شێوەی ژیان و هەستان و دانیشتن.
(٩) (أ) شەقامی تایبەتی بۆ پیاسە یا بە پێ ڕۆیشتن (کە ئۆتۆمبیلی پێدا ناڕوا).
(ب) شۆستە؛ پیادەڕێی ئەملاو ئەولای شەقام.
(١٠) ropewalk.
(١١) (أ) داری بە ڕیز ڕیز نێژراو. (ب) ماوەی نێوان دوو ڕیزە داری وەها.
(١٢) لەوەڕگاو جێی گەڕان (بەتایبەتی هی مەڕ).
(١٣) [British]. گوزەرگای ئاسایی ڕۆژانەی چەرچی یا دەستگێڕ.
(١٤) پێشبڕکێی ڕۆیشتن.

**walk away from,** (١) بۆرپێدان بە ئاسانی؛ لێ بردنەوە بە ئاسانی.
(٢) ڕزگاربوون لە ڕووداوێکی ناخۆش بەبێ ئازار پێ گەیشتن.
**walk away with,** = walk off with.
**walk off,** (١) ئەبڕ ڕۆیشتن.
(٢) بە پیاسە دانان (قەڵەوی)؛ بە پیاسە لە کۆڵ خۆ کردنەوە (خەمۆکی، خەم).
**walk off with,** (١) (أ) دزین. (ب) بردن (شتی خەڵك بەبێ پرس).
(٢) بردنەوە (پارە، یاری)؛ دەسکەوتن؛ قازانج کردن.
**walk of life,** پیشەو پلەی کۆمەڵایەتی؛ پلەوپایە؛ پیشە:
*( People from different walks of life)*
**walk out, [Colloq.],** (١) مان گرتن.
(٢) چوونە دەرەوە لە کۆبوونەوەیەك (بۆ ناڕەزایی دەربڕین).
**walk out on, [Colloq.],** بەجێهێشتن؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ وازلێهێنان:
*( He walked out on his wife and children.)*
**walk tall,** سەر بەرز گرتن؛ سەر دانەنواندن.
**walk the plank,** (١) زۆرلێکردن (لەلای چەتەی دەریاوە) بۆ ڕۆیشتنە سەر قەراغی تەختەدارێکی سەر کەشتی و کەوتنەخوارەوە بۆ ناو دەریا.
(٢) دەرکردن (لە ئیش)؛ بە زۆر واز پێ هێنان لە ئیش؛ لێ خستن.
**walk through,** بە لاسەرەلایی کردنی کارێك (بەتایبەتی یەکەم پەراوەی شانۆنامەیەك).

**walk-away** (wôk'ə-wā'), *n.* بردنەوە یا بۆرپێدانێکی ئاسان. (هەروەها " walkover ").
**walker** (wôk'ẽr), *n.* (١) پیاسەکەر؛ پیادە.
(٢) کەسێکە کە بە جۆرێکی تایبەتی ڕەفتار دەنوێنێ.
(٣) پێشبڕکێکەری ڕۆیشتن. (٤) چەرچی؛ دەستگێڕ.
(٥) ڕەوڕەوە (بۆ پێگرتنی منداڵ)؛ چوارچێوەی پێ ڕۆیشتنی کەسێکی قاچ گۆج یا ناتەواو. (٦) پێڵاوی تایبەتی بۆ ڕۆیشتن.
**walkie-talkie** (wôk'i-tôk'i), *n. Also* walky-talky, –وۆکی- تۆکی؛ ڕادیۆ یا تەلسزی پەیام وەرگرو نێرەر.
**walk-in** (wôk-in'), *adj.* (١) ئەوەندە گەورەیە کە پیاو بتوانێ بچێتە ناوی‌و بە پێوە تیایدا ڕابوەستێ (خانەی جل هەڵواسین کە بەشێکە لە ژووری نووستنی گەورە): *( a ~ closet)*.
(٢) یەکسەر لە شەقامەکەوە دەچێتە ناوی: *( a ~ apartment)*.
(٣) پێویست بە بەڵێن یا ژووانی پێشەکی ناکات: *( a ~ medical clinic)*.
**walking** (wôk'iŋ), *adj.* (١) گەڕۆك:
*( He is a ~ library.)*
(٢) بە پێ ڕۆیشتوو.
(٣) (أ) بەتایبەتی بۆ ڕۆیشتن کراوە: *( ~ shoes)*
(ب) بە پێ: *( a ~ tour)*
(٤) دەلەرێتەوە؛ دێت و دەچێت: *( a ~ beam)*.
(٥) بە پێ لێ دەخورێت یا کاری پێ دەکرێت: *( a ~ plow)*
***n.*** (١) بە پێ ڕۆیشتن؛ پیاسە. *( W~ is good exercise.)*.
(٢) ڕەوت؛ شێوەی ڕۆیشتن.
(٣) باری پیادەڕێ (لەڕووی باش و خراپییەوە بۆ پێدا ڕۆیشتن):
*( The ~ is slippery.)*
**walking delegate,** نوێنەری گەڕۆك (یەکێتی کرێکاران)
**walking fern,** = walking leaf # 2.
**walking leaf,** (١) گەڵای گەڕۆك. مێرووییەکە باڵ و پەلەکانی لە گەڵا دەچن.
(٢) قژە کەنیشکی.
**walking papers, [Colloq.],** ئاگانامەی دەرکردن لە ئیش؛ دەرکردن:
*( She got her walking papers yesterday.)*
(هەروەها " walking tickets ").
**walking stick,** (١) داردەست؛ گۆچان
(٢) مێرووی چیلکەیی؛ مێرووییەکە وەك کوڵەحاجی.
**walk-on** (wôk'on'), *n.* دەورێکی زۆر ئاسەرەکی بێ دەنگ لە شانۆگەرییەکدا
**walk-out** (wôk'out'), *n.* (١) مان گرتن. (٢) کشانەوە یا چوونە دەرەوە لە کۆبوونەوەیەك یا حیزبێك (بۆ ناڕەزایی دەربڕین).
**walk over, [Colloq.],** (١) ڕەفتاری ناشرین لەگەڵدا نواندن؛ بە سووك سەیرکردن؛ ماف پێشێل کردن:
*( He lets his co-workers walk all over him.)*
(٢) بە ئاسانی بردنەوە (پێشبڕکێ)؛ بە ئاسانی بۆرپێدان.
**walk-over** (wôk'ō'vẽr), *n.* (١) پێشبڕکێیەکی غارغارێنی یەك ئەسپی (کە ئەسپەکە دەبیاتەوە ئەگەر هەر بڕوات و غاریش نەکات).
(٢) walk-away.
**walk-up** (wôk'up'), *n.* [Colloq.], خانوو، خانووچکە، یا فەرمانگەیەکی بێ ئەسانسێر.
*adj.* هی خانوویەکی وەها؛ لە خانوویەکی وەهادا: *( a ~ apartment)*.
**walk-way** (wôk'wā'), *n.* پێ ڕێ؛ ڕێچکە؛ پیادەڕێ.
**wall** (wôl), *n.* (١) دیوار. (٢) *(pl.)* شووره؛ دیواری بەرگری.
(٣) بەنداو؛ بەست.
(٤) شتێکی وەك دیوار؛ دیوار (گەدە): *( the abdomen ~ )*
(٥) شتێکی دیوار ئاسایی. *( a ~ of silence)*
(٦) پەرێشانی؛ بێ هیوایی؛ بارودۆخێکی پەرێشان یا بێ هیوا:
*( to drive someone to the ~ )*
*v.t.* (١) ( ~ off )، دیوار بە دەوردا درووستکردن؛ دەورەدان بە دیوار.
(٢) جیاکردنەوە بە شکردن بە دیوار: *( to ~ off half a room)*
(٣) ( ~ up )، داخستن بە دیوار (دەرگا، کون، دەلاقە).

*adj.* (١) دیواری؛ تایبەتی بە دیوار. (٢) بە دیواردا هەڵگەڕاو.

**bang ( or run ) one's head against a (brick) wall,** سەری خۆ لە دیوار دان؛ هەوڵی بێ سوود دان؛ بە خۆڕایی خۆ ماندووکردن.

**drive ( or push ) to the wall,** خستنە بارودۆخێکی زۆر خراپەوە؛ ناچارکردن

**drive ( a person ) up the wall,** شێت کردن؛ زۆر تووڕەکردن.

**walls have ears,** دارو دیوار گوێی هەیە.

**wallaby** (wäl′ə-bi), *n.* کەنگەری بچووک

**wallah** (wä′lä), *n. Also* walla, (١) کارگەر؛ کەسێکە کە ئیشێکی تایبەتی دەکا؛ ئیشکەر: *( a kitchen ~ )*
(٢) [Colloq.]. کەس؛ مرۆڤ.

**wallaroo** (wäl′ə-roo′), *n.* کەنگەری گەورە (لە ناوچە گرداوییەکانی ئوسترالیا دەژی.

**wallboard** (wôl′bōrd′, wôl′bōrd′), *n.* تەبەقی دیوارو بنمیچ پێ داپۆشین (لە گەچ یا ئاردە دار درووست دەکرێت).

**wall creeper,** باڵندەیەکی بچووکە لە کەندەڵان و دیوارو بنمیچدا دەژی.

**walled** (wôld), *adj.* (١) دیواردار؛ بە دیوار دەورەدراو
(٢) شووردەدار؛ بە شوورە دەورەدراو *( a ~ city)* .

**wallet** (wäl′it, wôl′it), *n.* (١) [Archaic]. هەگبە؛ جەوال؛ توورەکەی شان (بۆ ڕێگە). (٢) جزدان؛ کیسەی پارە.

**wall-eye** (wôl′ī′), *n.* (١) چاوێکە ڕەشێنەکەی سپیکار بێت یا کۆرنیاکەی سپی بێت (وەك چاوی ئەسپ) (٢) چاوی خێل.
(٣) چاوی گەورەو دەرپۆقیوو زەق (وەك هی هەندێ ماسی).
(٤) چەند جۆرە ماسییەکی چاو گەورەو زەق و دەرپۆقیون.

**wall-eyed** (wôl′īd′), *adj.* (١) چاوی سپێنەکەی زۆرە (چاوی ئەسپ).
(٢) خێل؛ چاو خێل (٣) چاو گەورەو زەق و دەرپۆقیو (وەك هی هەندێ ماسی).
(٤) چاوبر؛ چاو زەق و دڕندانە (٥) [Slang]. مەست؛ سەرخۆش

**wall fern,** قژە کەنیشکی بە کەندەڵان و دیواردا هەڵگەڕاو.

**wallflower** (wôl′flou′ẽr), *n.* (١) شەوبۆ
(٢) [Colloq.]. گوڵی سەر دیوار: کچێکە کە لە تەنیشت دیوارەکەوە دادەنیشێ لەناو سەماخانەدا چونکە کەس داوای لێ نەکردووە سەمای لەگەڵ بکات

**wallop** (wäl′əp), *v.i.* [Dial. or Colloq.], (١) پەل کوتان؛ خۆ بەکێش کردن؛ بە گران ڕۆیشتن؛ گەلاوگەڵ ڕۆیشتن. (٢) غارکردن.
(٣) گیزەگیرکردن (ئاوی کوڵاو)

*v.t.* [Colloq.], (١) بیرازکردن؛ تێهەڵدان؛ کوتان؛ باش لێدان
(٢) مستەکوڵەی قایم لێدان.
(٣) زۆر باش بەزاندن؛ باش بۆڕپێدان.

*n.* [Colloq.]. (١) (ا) پەل کوتان؛ خۆ بەکێش کردن. (ب) غار.
(٢) (ا) مستەکوڵەی قایم
(ب) توانای مستەکوڵەی قایم لێدان

**-walloper** *(n.).*

**walloping** (wäl′əp-iŋ, wôl′əp-iŋ), *adj.* [Colloq.]. زۆر زل؛ زۆر گەورە *( a ~ big boy; a ~ fish)*

*n.* [Colloq.], (١) بیرار؛ کوتان؛ لێدانێکی زۆر
(٢) بەزینێکی پیس؛ دۆڕانێکی زۆر خراپ

**wallow** (wäl′o, wôl′ō), *v.i.* (١) تلانەوە؛ خۆگەوزاندن؛ تەپاوتل کردن؛ تلاوتل کردن.
(٢) بە گران ڕۆیشتن و بەم دیوو بەو دیودا کەوتن (کەشتی)؛ بە تلاوتل ڕۆیشتن.
(٣) بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن؛ پێوە خەریك بوون و خۆشی لێ بینین:
*( to ~ in vice; to ~ in physical pleasures)*
(٤) لێ هەڵسان (دووکەڵ، گڕ)؛ لێوە هاتنەدەرەوە؛ لێ بوونەوە

*n.* (١) تلانەوە؛ خۆگەوزان؛ تەپاوتل؛ تلاوتل
(٢) شوێنی خۆگەوزان (قوڕاو، شوێنی تەپوتۆزاوی)

**-wallower** *(n.).*

**wallpaper** (wôl′pā′pẽr), *n.* کاغەزی دیوار؛ کاغەزی لە دیوار گرتن.

*v.t.* کاغەز گرتن لە دیوار.

**Wall Street,** وۆڵ ستریت: (١) شەقامێکە لە شاری نیویۆرك مەڵبەندی سەرەکی دارایی ئەمەریکایە. (٢) بازاڕی پارەو پارەبازی ئەمەریکا؛ پارەبازەکانی ئەمەریکاو هەڵوێست و دەسەلاتیان.

**wall-to-wall** (wôl′tə-wôl′), *adj.* لە دیوارەوە بۆ دیوار (ڕاخەری ناو ژوور): *( ~ carpeting)* .

**wally** (wā′li), *adj.* [Scot.], (١) نایاب؛ زۆر باش.
(٢) بەهێز؛ گەورە؛ زۆر. (٣) لەبار.

**wally-drag** (wā′li-drag′, wäl′i-dräg′), *n.* [Scot.], *Also*- **wally-draigle,** بەچکەی گەند یا لاواز؛ پاشەبەرەی گەند؛ گیانەوەری لاواز.

**walnut** (wôl′nut′, wôl′nət′), *n.* (١) گوێز. (٢) دارگوێز.
(٣) دارو تەختەی گوێز.
(٤) گوێزی؛ ڕەنگی گوێز؛ قاوەیی زۆر کاڵ.

**walrus** (wôl′rəs, wäl′rəs), *n.* فیلی دەریا: گیاندارێکی کەتەیە لە " **seal** " دەچێ، بەڵام ئەم شفرەی هەیە.

*adj.* وەك هی فیلی دەریا (بەتایبەتی سمێڵی کلك درێژو شۆڕ).

**waltz** (wôlts; *esp.* Brit. wôls), *n.* والس: (١) جۆرە سەمایەکە.
(٢) مۆسیقای ئەم سەمایە

*adj.* تایبەتی بە سەماو مۆسیقای والس.

*v.i.* (١) سەمای والس کردن.
(٢) (ا) بە لامسەرلایی و بە گورج ڕۆیشتن: *( to ~ in late for dinner)* .
(ب) ( **~ through** )، بە سووك و ئاسانی کردن یا پیا ڕۆیشتن:
*( to ~ through an exam)*

*v.t.* (١) سەمای والس لەگەڵ کردن.
(٢) پەل گرتن و بردن: *( He ~ed him into the principal's office.)*

**wamble** (wäm′'l), *v.i.* [Chiefly British Dial.], (١) تلانەوە (لە ئازاردا)؛ تەپاوتل کردن؛ خۆ گرمۆڵەکردن؛ خۆ وەرگەڕان بەم دیوو بەودیودا. (٢) لەتردان؛ بەم لاو بەولادا کەوتن.
(٣) [Obs.]، دڵ تێکەڵهاتن؛ ڕێنچ بە سکدا هاتن.

*n.* (١) تلانەوە بە ئازارەوە؛ تەپاوتل.
(٢) لەتر؛ لەتردان؛ بەم دیوو بەودیودا کەوتن. (٣) دڵ تێکەڵهاتن.

**-wamblingly** *(adv.)*; **wambly** *(adj.).*

**wampum** (wäm′pəm), *n.* (١) مووروویی گوێچکەماسی (هیندییە ئەمەریکاییەکان وەك خشڵ و پارە بەکاریان دەهێنا)؛ ملوانکەی ئەم جۆرە مووروانە. (٢) [Slang]. پارە.

**wampumpeag** (wäm′pəm-pēg′), *n.* **wampum # 1 .**

**wan** (wän, wôn), *adj.* (١) زەرد هەڵگەڕاو؛ زەرد؛ بێ ڕەنگ: *( a ~ face)*
(٢) نەخۆش؛ لاواز؛ بێ هێز؛ ماندوو: *( a ~ smile, look, etc.)*
(٣) بێ سوود؛ بێ هێز؛ سەرنەکەوتوو.
(٤) [Archaic]. (ا) تاریك؛ دڵتەنگکەر. (ب) زەرد

*v.i.* ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان؛ نەخۆش کەوتن؛ ڕەنگ تێکچوون.

*v.t.* ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاندن؛ نەخۆش خستن؛ ڕەنگ تێکدان.

**wand** (wänd, wônd), *n.* (١) خەڵف (بەتایبەتی هی دارەبی)؛ چڵ.
(٢) داری مۆسیقاژەن. (٣) **scepter** .
(٤) (ا) داری ئەفسوونەیی پەری.
(ب) داری جادووگەر: *( magic ~ )*
(ج) **divining rod** (٥) داری تیر هاویشتن (وەرزش).

**wander** (wän′dẽr, wôn′dẽr), *v.i.* (١) سوڕانەوە؛ خولانەوە؛ خول خواردن (٢) گەڕان
(٣) (ا) ( **~ from** )، وون بوون؛ لە ڕێگە لادان؛ ڕێگە بەجێهێشتن
(ب) ( **~ off** )، دوورکەوتنەوە (لە کەس‌وکار یا جێگەی خۆ)؛ سەرگەردان بوون؛ ئاوارەبوون؛ سەرەڕۆیی کردن (٤) (ا) لە باس لادان (دوان، نووسین)
(ب) گومڕابوون؛ بە ڕێی هەڵەدا چوون (ڕەووشت)؛ خوو خراپ بوون

(ج) وڕێنەکردن؛ قسە بزرکاندن؛ قسەی هەڵەق مەلەق کردن.
(٥) پێچاوپێچ کردن یا ڕۆیشتن (وەك ڕووبار)
(٦) بازدان لە شتێکەوە بۆ شتێکی تر (چاو، سەیرکردن، نووسین)؛ گەڕاندن:
*( Her eyes ~s.)*
**v.t.** [Poetic], پێدا گەڕان؛ پێدا سوڕانەوە: *( He ~ed the forests.)* .
**n.** گەڕان؛ پیاسە
**wanderer** (wän′dēr-ēr, wôn′dēr-ēr), **n.** گەڕۆك گەڕیدە؛ سەرەڕۆ؛ وێڵ؛ ڕەوەند؛ سەرگەردان.
**wandering** (wän′dēr-iŋ, wôn′dēr-iŋ), **adj.** (١) گەڕۆك؛ وێڵ؛ سەرەڕۆ؛ سوڕاوە؛ سەرگەردان. (٢) کۆچەر؛ ڕەوەند؛ گەڕۆك: *( ~ tribes)* .
(٣) پێچاوپێچ (ڕووبار، ڕێگە).
(٤) تەرز فرێندەر *( ~ plants)* .
**n.** (١) سوڕانەوە؛ خولانەوە؛ گەڕان.
(٢) (*pl.*) گەشت (بەتایبەتی هی دوورو درێژو بێ مەبەست)؛ گەڕان.
(٣) (*pl.*) وڕێنە؛ قسەی بزرکاو؛ قسەی هەڵەق مەلەق.
**Wandering Jew,** (١) جوولەکەی سەرگەردان جوولەکەیەکە بەپێی ئەفسانەی کۆن سزای بەوە دراوە کە هەر وێڵ و سەرگەردان بێ و بە سەرزەمیندا بگەڕێ هەتا هاتنی دووەم جاری عیسا بۆ سەرزەمین چونکە گاڵتەی بە عیسا کردبوو لە ڕۆژی هەڵواسینیدا. (٢) [w- J-]؛ ڕووەکێکی خشۆکی تەرز ماوێژی لاسك و گەڵا ساقە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێ
**wanderlust** (wän′dēr-lust′, wôn′dēr-lust′), **n.** حەزی گەشت و گوزار؛ تاسەی گەشتکردن.
**wanderoo** (wän′də-rōō′), **n.** مەیموونێکی هیندی و سیلانییە.
**wane** (wān), **v.i.** (١) مانگ کەل بوون؛ بچووك بوونەوە (مانگ)؛ شکانەوە.
(٢) کزبوون (ڕووناکی، شەوق).
(٣) کزبوون (دەسەڵات، سامان، گرنگی)؛ کەم بوونەوە؛ کەم کردن:
*( ~ing influence, power, prosperity, popularity, etc.)*
(٤) بەرەو نەمان چوون؛ بەرەو کۆتایی چوون؛ دوایی هاتن.
**n.** (١) (أ) مانگ کەل بوون؛ مانگ شکانەوە یا بچووك بوونەوە.
(ب) کاتی مانگ کەل بوون (٢) کزبوون (دەسەڵات، سامان)؛ کەم بوونەوە.
(٣) کاتی کزبوون؛ ماوەی کەم بوونەوە یا بەرەو نەمان چوون؛ سەردەمی بە ناحدا چوون.
**on the wane,** بەرەو نەمان دەچێ؛ لە ناوبووندایە؛ لە کزیدایە؛ لە کەم بوونەوەدایە.
**wangle** (waŋ′g'l), **v.t.** [Colloq.]. (١) بە فێڵ و تەڵەکە دەسکەوتن:
*( He ~d a good job at a very young age.)*
(٢) دەستکاری کردن یا گۆڕین بۆ سوودی خۆ؛ ساختە تێدا کردن:
*( to ~ statistics, accounts, etc.)*
(٣) خۆ ڕزگارکردن لە تەنگ و چەڵەمەیەك
**v.i.** [Colloq.], (١) فێڵ و تەڵەکە بەکارهێنان بۆ گەیشتنە ئەنجامی خۆ.
(٢) خۆ ڕزگارکردن لە تەنگ و چەڵەمەیەك
**n.** [Colloq.], خۆ ڕزگارکردن یا کشاندنەوە لە تەنگ و چەڵەمەیەك.
**-wangler** *(n.)*.
**wangian** (waŋ′gi-ən), **n.** *Also* **wangan, wangun, wannigan,** (١) گەنجینە یا دۆڵابی ئازووقەو وردەشتی هەوارگەی دارکەران.
(٢) کەپەنەیەکی بچووك یا کۆشکێکە بەسەر ڕەدیڕەوە بۆ حەوانەی دارکەران.
**wanion** (wôn′yən), **n.** [Archaic]. بەدبەختی؛ نەگبەتی؛ لەعنەت؛ ئاعوون (تەنها لەم وتەیەدا بەکاردێت: " with ( or in ) a wanion " ) .
**want** (wänt, wônt), **v.t.** (١) کەم بوون؛ کەم وکووڕی هێنان؛ نەبوون؛ ناتەواو بوون (٢) ویستن؛ کەم بوون؛ ماوێتی
*( It ~s ten minutes to midnight.)*
(٣) زۆر حەزکردن *( He ~s adventure.)*
(٤) ویستن؛ حەزکردن؛ گەرەك بوون *( She ~s to go with us.)* .
(٥) (أ) حەز بە بینین کردن یا قسە لەگەڵ کردن *( Your mother ~s you.)* .
(ب) بە دوادا گەڕان بۆ گرتن (تاوانبار) *( He is ~ed by the police.)* .
(ج) پێویست پێ بوون *( W~ed: a cook for a small restaurant)* .
(٦) پێویست بەوە کردن؛ پێویست بوون:
*( You ~ to eat before you go.)*
**v.i.** (١) ( ~ **for** )، لێ کەم بوون؛ نەبوون؛ پێویست پێ بوون؛ ناتەواوی بوون؛ ویستن: *( We didn't ~ for anything. We shall not ~ for money.)*
(٢) دەستکورت بوون؛ هەژار بوون؛ پێویستی هەبوون.
(٣) [Rare or Archaic]، هەر ئەوەندە کەم بوون یا مابوون.
**n.** (١) کەم وکووڕی؛ کەمی؛ نەبوون (٢) هەژاری؛ نەبوونی؛ دەستکورتی
(٣) حەز؛ ئارەزوو؛ تاس.
(٤) ویستەمەنی؛ پێویستی؛ شتی پێویست یا ویستراو.
**want ad,** [Colloq.], بلاونامەی ویستن: بلاونامەی ڕۆژنامەیە بۆ ئیش یا ئیشکەر ویستن، شت کڕین و فرۆشتن... هتد.
**wanting** (wän′tiŋ, wôn′tiŋ), **adj.** (١) نیەتی؛ ونە؛ ناتەواوە؛ ئەوەی کەمە: *( a motor with some of the parts ~ )*
(٢) کەم؛ ناتەواو؛ لێ نەهاتوو.
**prep.** (١) بەبێ؛ بێ.
*( W~ mutual trust, friendship is impossible.)*
(٢) ئەوەندەی کەمە؛ ئەوەندەی ئەوێ: *( a century ~ five years)* .
**wanting in.** کەم وکووڕی هەیە لەوەدا؛ لەوەدا ناتەواوە؛ نیەتی:
*( He is wanting in courtesy.)*
**wanton** (wän′tən, wôn′tən), **adj.** (١) لاسار؛ سەرکێش؛ هاروهاج؛ دڕ؛ ناپەسەند: *( ~ boys)*
(٢) داوێن پیس؛ سەرسەری؛ بێ ڕەووشت؛ سووك؛ بێ ئابڕوو:
*( a ~ woman)*
(٣) [Poetic]، (أ) بزێو؛ گەمەکەر؛ یاریکەر: *( a ~ child)* .
(ب) قایم؛ بەر بەرەڵا *( ~ winds)* .
(٤) دڕندە؛ بەد؛ ناپەسەند؛ ناڕەوا: *( ~ cruelty; a ~ insult)*
(٥) بێباك؛ بە تەنگ هەستی خەڵکەوە نەهاتوو.
(٦) [Poetic]؛ (أ) زۆر پەرەسەندوو (گژوگیا)؛ چڕ؛ پڕ.
(ب) شۆخ (جل)؛ زیادەڕۆ
**n.** ژنی سووك و بێ ئابڕوو؛ ژنی بەرەڵا.
**v.i.** (١) زۆر دەستبازی کردن؛ بەر بۆ خۆ بەرەڵاکردن (جووت بوون، خۆشی پەرستی). (٢) بزێوی کردن؛ زۆر یاری کردن.
(٣) زیادەڕۆیی کردن (ڕەووشت) (٤) زۆر پەرەسەندن (گژوگیا، درەخت).
**v.t.** بەفیڕۆدان؛ پارە زۆر خەرج کردن بۆ سەرسەرەیتی.
**-wantoner** *(n.)*; **wantonly** *(adv.)*; **wantonness** *(n.)*.
**wapentake** (wäp′ən-tāk′), **n.** (١) ناوچە یا هەرێمێکی بچووکی کۆنی ئینگلتەرەو وڵاتە باکوورەکانی ئەورووپایە.
(٢) دادگای هەرێمێکی بچووکی وەها.
**wapiti** (wäp′ə-ti), **n.** ئاسك یا بەرانە کێوی گەورەی ئەمەریکی
**wappen-schawing** (wäp′ən-shô′iŋ), **n.** خۆنوواندنی هێزی چەکداری ناوچە (لە سکۆتلەندە).
**wapper-jaw** (wäp′ēr-jô′), **n.** کاژێری خوارەوەی دەرپۆقیو؛ کاژێر خوار.
**-wapperjawed** *(adj.)*.
**war** (wôr), **n.** (١) جەنگ؛ شەڕ؛ شەڕوشۆڕ.
(٢) جەنگناسی؛ زانستی شەڕوشۆڕ.
(٣) ناکۆکی؛ دوژمنایەتی *( the ~ between the sexes)* .
(٤) خەبات؛ کۆشش کردن دژی: *( the ~ against crime and disease)*
**adj.** جەنگی؛ لە شەڕدا بەکاردەهێنرێ؛ لە جەنگدا ڕووداو؛ هی جەنگ.
*( ~ crimes)*
**v.i.** (١) جەنگان؛ جەنگ کردن؛ شەڕکردن.
(٢) خەبات کردن دژ بە؛ دوژمنایەتی کردن
**at war,** لە جەنگدا بوون؛ لە شەڕدا بوون:
*( The two countries were at war for ten years.)*

**declare war on,** (١) جاڕی جەنگ دان؛ جاڕی شەڕ دان
(٢) دوژمنایەتی خۆ نیشاندان بەرامبەر؛ خەبات کردن دژ بە.
**go to war,** جەنگ کردن شەڕکردن؛ چوونە شەڕەوە
**wage war (up) on,** شەڕ بەرپاکردن؛ دەست بە جەنگ کردن؛ جەنگان دژ بە.

**warble** (wôr′b′l), *v.t.* (١) خوێندن بە دەنگێکی خۆش (باڵندە)
(٢) بە گۆرانی‌یەوە وتن؛ بە گۆرانی یا هۆنراوەوە وتن
*v.i.* (١) خوێندن بە دەنگێکی خۆش (باڵندە) (٢) خورەخوڕ هاتن (جۆگەلە).
(٣) گۆرانی وتن؛ هۆرەکردن.
*n.* (١) خوێندن (باڵندە) (٢) گۆرانی؛ هۆرە.

**warble** (wôr′b′l), *n.* (١) جدەو؛ دڕینێکە لە شان و پشتی وڵاخ دێت بەهۆی گرتنی زین و کورتانەوە (٢) برینێکە لەژێر پێستی ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ دێت بەهۆی کرمۆکەی مێشی ئاژەڵەوە (٣) گەرای مێشی ئاژەڵ.
**warble fly** (٤)

**warble fly,** مێشی ئاژەڵ مێشێکە لەژێر پێستی ئاژەڵ و وڵاخدا دەژی و گەرا دادەنێت و برینی لێ دێنێت

**warbler** (wôr′blẽr), *n.* فیرنەگولە؛ باڵندەیەکی بچووکی ڕەنگینی دەنگ خۆشە بە کۆمەڵەی چۆلەکە

**war club,** کوتەکێکی سەر ئاسنین یا بزماراوی‌یە (چەکی هیندی‌یەکانی ئەمەریکایە

**war chest,** (١) پارەی تەرخان کراو بۆ جەنگ
(٢) پارەی تەرخان کراو بۆ مەبەستێك یا هێرشێکی تایبەتی.

**war correspondent,** پەیامنێری جەنگ

**war crime,** تاوانی جەنگ؛ ئەو تاوانانەی لە جەنگدا دەکرێن و دژی نەریت و دەستووری جەنگ وەك دیل ئازاردان و کۆمەڵ کوژی.

**war cry,** (١) هاواری جەنگ هاواری سەربازە لەکاتی هێرش بردندا
(٢) درووشمی خەباتکەرانی مەسەلەیەکە.

**ward** (wôrd), *v.t.* (١) (~ **off**) لە خۆ لادان؛ لێ لادان (چاوی پیس. نزای خراپ)؛ خۆ لێ پاراستن؛ لێ پاراستن:
*( to ~ off evil, a blow, catastrophe, etc.)*
(٢) نەخۆش خستنە قاوشی خەستەخانەوە
(٣) [Archaic]. پاسەوانی کردن؛ پاراستن.
*n.* (١) پاراستن (٢) لەژێر پاراستندا بوون.
(٣) (ا) سپاردە؛ پێ سپاردە؛ منداڵێك یا کەسێکی بێ توانای سپێردراو بە کەسێکی گەورە. (ب) پێ سپاردن (منداڵ). (ج) مەرجی ئەم پێ سپاردنە.
(د) کەسێکە کە سپێردرابێت بە کەسێکی تر.
(٤) قاوشی خەستەخانە؛ بەشێکی خەستەخانە یا شێتخانە:
*( the maternity ~ )*
(٥) قاوش یا ژووری گەورەی بەندیخانە
(٦) گەڕەك؛ ناوچەیەکی شار. (٧) **wapentake**
(٨) هۆی بەرگری یا پارێزگاری
(٩) هەڵوێست یا وەستانێکی پارێزگاری (شیربازی)
(١٠) حەوشەی قەڵا یا شوێنێکی شوورەدار.
(١١) [Archaic]. پاسەوان؛ نۆبەچی
(١٢) (ا) دانی قفڵ (ب) دانی کلیل

**-ward** (wẽrd), پاشگرێکە بەمانای بەرەو
*( backward, eastward)*

**war dance,** سەمای جەنگ سەمایەکە خێڵە سەرەتایی‌یەکان دەیکەن پێش چوونە شەڕەوە یا لە خۆشی سەرکەوتندا.

**warded** (wôr′did), *adj.* داندار (کلیل. قفل)

**warden** (wôr′d'n), *n.* (١) پارێزگار (٢) سەرەك زیندان؛ زیندانەوان؛ سەرۆکی بەندیخانە؛ کارگێڕی بەندیخانە (٣) (ا) پارێزەری ناوچە.
(ب) کارگێڕی فەرمانگەی میری (ج) کارگێڕی بەندەر.
(٤) ئەندامی ئەنجوومەنی سەرپەرشتی زانستگا. خەستەخانە. یا یەکێتی کرێکاران (لە ئینگلتەرە). (٥) **churchwarden**
(٦) [Rare]. پاسەوان؛ حەسحەس؛ نۆبەچی.

**wardenry** (wôr′d'n-ri), *n. Also* **wardenship**, پلەوپایەو کاری بەڕێوەبەری بەندیخانە.

**warder** (wôr′dẽr), *n.* (١) پاسەوان؛ نۆبەچی
(٢) دەرگاوان؛ پاسەوانی دەرگا
(٣) [Chiefly British]. **warden # 2**.
-wardership *(n.).*

**warder** (wôr′dẽr), *n.* گورزی پاشا یا فەرماندەر.

**ward heeler,** بە کرێ گێراوێکە دەنگ بۆ حیزبێك یا نوێنەرێکی حیزب کۆدەکاتەوە.

**wardress** (wôrd′ris), *n.* [Chiefly Br.]. مێینەی " **warder** ".

**wardrobe** (wôrd′rōb′), *n.* (١) کەنتۆر؛ دۆڵابی جلوبەرگ
(٢) ژووری جلوبەرگی نوێنەرانی شانۆگەری.
(٣) (ا) جلوبەرگی کەسێك.
(ب) جلوبەرگی وەرزێك یا مەبەستێکی تایبەتی. *( a spring ~ )*
(ج) جلوبەرگی شانۆیەك یا تیپێکی شانۆگەری.
(٤) بەشی جلوبەرگ لە کۆشکی پاشادا

**wardroom** (wôrd′rōōm′, wôrd′room′), *n.* (١) جێگەوڕێکەی ئەفسەرانی کەشتی جەنگ بەتایبەتی ژووری نان خواردنیان.
(٢) ئەفسەرانی کەشتی جەنگ بەگشتی

**-wards** (wẽrdz), = ward.

**wardship** (wôrd′ship′), *n.* (١) پێ سپاردنی منداڵ؛ ئیش‌وکاری منداڵ پێ سپێردراو.
(٢) سپاردەیی؛ سپێردران بە گەورەیەك (منداڵ).

**ware** (wâr), *n.* (١) (*pl.*)، فرۆتەنی؛ شتومەکی فرۆشتن.
(٢) جۆرە شتومەکێکی تایبەتی:
*( glassware, hardware, silverware)*
(٣) گلێنە؛ کاشی؛ گۆزەودیزە.

**ware** (wâr), *adj.* [Archaic], (١) بە ئاگا؛ هۆشیار؛ ئاگادار
(٢) وریا. (٣) ژیر.
*v.t.* وریا بە!؛ چاوت لەبەرپێی خۆت بێ! (بەتایبەتی لە تێخوڕینی تانجی و سەگی ڕاودا): *( W~ hounds, wire, traps!)*

**ware** (wâr), *v.t.* [Scot. & N. Eng. Dial.], کات بردنەسەر؛ پارە خەرج کردن.

**warehouse** (wâr′hous′), *n.* (١) عەمار (فرۆتەنی)؛ بارخانە
(٢) [Chiefly British]، فرۆشگای کۆ؛ فرۆشگای زۆر گەورەی تاك.
*v.t.* خستنە بارخانە یا عەمار (بەتایبەتی هەتا گومرگ لەسەر شتەکە دەدرێ)

**warehouseman** (wâr′hous′mən), *n.* کارگێڕ، خاوەن، یا کارگەری عەماری فرۆتەنی.

**wareroom** (wâr′rōōm′, wâr′room′), *n.* دووکان؛ فرۆشگا؛ پیشانگای فرۆتەنی

**warfare** (wôr′fâr′), *n.* (١) شەڕوشۆڕ؛ جەنگ؛ شەڕ
(٢) ناکۆکی؛ دوژمنایەتی؛ خەبات.

**warfarin** (wôr′far′in), *n.* ئاوێتەیەکی کیمیایی‌یە بۆ جانەوەر کوشتن و پزیشکەوانی بەکاردێت.

**war footing,** ئامادەبوون بۆ جەنگ؛ ئامادەیی جەنگ:
*( The army is now on a ~ .)*

**war game,** *Also* war games, لاسایی جەنگ؛ یاری جەنگ؛ مناوەرەی سوپا.

**war head,** سەری مووشەك و بۆمبا؛ ئەو بەشەی مووشەك و بۆمبایە کە تەقەمەنی‌یەکەی تێدایە.

**war-horse** (wôr′hôrs′), *n. Also* war horse, (١) ئەسپی جەنگ
(٢) [Colloq.]، خەباتکەری کۆن و شارەزا؛ کەسێکە کە لە ژیانیدا گەلێك ناکۆکی و شتی تری دیوە؛ سەربازی کۆن. (٣) [Colloq.]. شانۆنامەیەك یا پارچەیەك مۆسیقایە کە ئەوەندە بینراوە و بیستراوە کۆن و بێ تام بووە.

**warily** (wâr′ə-li), *adv.* بە وورپایی؛ بە ترسەوە؛ بە ئاگاداری.
**wariness** (wâr′i-nis), *n.* وورپایی؛ ترس؛ ئاگاداری.
**warison** (war′ə-s'n), *n.* (١) [Obs.]. پاداشت (لە سەرگەورەوە).
(٢) شەیپووری جەنگ؛ زورنای هێرش بردن.
**warlike** (wôr′līk′), *adj.* (١) جەنگاوەر؛ شەڕانی؛ شەڕەنگێز:
*(~ tribes; a ~ people)*
(٢) جەنگی: *(a ~ expedition)*.
(٣) هەڕەشەیی: نیشانەی شەڕە: *(a ~ tone; ~ propaganda)*.
**warlock** (wôr′lok′), *n.* [Scot. & Archaic]. جادووگەر؛
جادووباز؛ نوشتەکەر.
**war-lord** (wôr′lôrd′), *n.* (١) سەرلەشکر؛ فەرماندەی سوپا
(بەتایبەتی لە وڵاتێکی پەشێودا کە میری دەسەڵاتی نەمابێ).
(٢) سەرەک چەتە (بەتایبەتی لە ناوچەیەکدا کە میری هەر بە ناو تێیدا مابێ).
(٣) زۆردار؛ زۆرکار؛ ستەمکار.
**warm** (wôrm), *adj.* (١) (ا) شلەتێن:
*(~ water, coffee, tea, etc.)*
(ب) نیمچە گەرم: *(~ weather)*.
(ج) گەرم؛ نیمچە گەرم؛ گەرمی دەداتەوە: *(a ~ fire)*.
(٢) پلەی گەرمی ئاسایی‌یە وەک هی هەموو گیانەوەرێک (خوێن، لەش).
(٣) (ا) گەرمایەتی؛ گەرمە.
(ب) گەرمکەرەوە: *(~ exercise, work, etc.)*.
(٤) گەرم *(~ clothing; a ~ coat)*.
(٥) گەرم (مشتومڕ، ووتووێژ).
(٦) گەرموگوڕ؛ گەرم: *(~ support, encouragement, etc.)*.
(٧) کەللە گەرم؛ زووهەڵچوو؛ توورەوتڕۆ.
(٨) (ا) گەرم؛ گەرموگوڕ؛ بەدڵ: *(a ~ welcome)*.
(ب) دڵسۆزانە؛ گەرم: *(~ thanks)*.
(ج) خۆشەویستانە؛ بەسۆز؛ گەرم: *(a ~ embrace)*.
(٩) سوور یا پرتەقاڵی (کە نیشانەی گەرمی‌یە): *(~ colors; a ~ sunset)*.
(١٠) تازە (شوێن پێ)؛ نوێ؛ زۆری بە سەردا نەچووە: *(a ~ trail)*.
(١١) [Colloq.]. نزیکی هەڵهێنانە (مەتەڵ).
(١٢) [Colloq.]. ناخۆش (باروودۆخ)؛ هەراس پێ هەڵگیراو:
*(We made things ~ for him.)*
(١٣) [Colloq.]، خۆش گوزەران؛ دەوڵەمەند.
*adv.* بە گەرمی؛ بە شێوەیەکی گەرم.
*v.t.* (١) گەرم کردن؛ پلەی گەرمی بەرزکردنەوە.
(٢) جۆشدان؛ هێنانە جۆش؛ گورج کردنەوە؛ خرۆشاندن.
(٣) دڵخۆش کردن؛ هەست بە خۆشی کردن:
*(The sight of the children ~s my heart.)*
*v.i.* (١) گەرم بوون؛ گەرم بوونەوە. (٢) جۆش هەڵسان؛ خرۆشان.
(٣) (~ to)، ڕووکرانەوە لەگەڵ؛ پێ خۆش بوون؛ ڕوو خۆش بوون:
*(She ~ed to the room at once.)*
*n.* گەرم بوونەوە؛ گەرم بوون؛ گەرم کردنەوە.
**warm up,** (١) گەرم کردن:
*(Please warm up the engine before driving the car.)*
(٢) گەرم کردنەوە (خواردەمەنی): *(She warmed up the food.)*.
(هەروەها " **warm over** ").
(٣) ڕووکرانەوە؛ ڕوو خۆشتر بوون:
*(The baby warmed up to us in no time.)*
(٤) مەشقی هێواش کردن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ پێشبڕکێ:
*(to warm up before a race)*
**warm-blooded** (wôrm′blud′id), *adj.* (١) خوێن گەرم و گەرمی
لەش نەگۆڕ (باڵندەو گیانداری شیردەر) (٢) خوێن گەرم؛ سەرگەرم؛ دڵ گەرم.
**-warmbloodedness** *(n.)*.
**warmed-over** (wôrmd-ō′vẽr), *adj.* [Colloq.], (١) گەرم
کراوەتەوە: *(~ food)*
(٢) کۆن؛ لەوەوپێش بیستراوە: *(~ jokes, tales)*.
**warmer** (wôrm′ẽr), *n.* گەرمکەرەوە (ئامێر): *(a hand- ~)*.
**warm-hearted** (wôrm′här′tid), *adj.* میهرەبان؛ هاوسۆز؛
دڵنەرم؛ ڕووخۆش.
**-warm-heartedly** *(adv.)*; **warm-heartedness** *(n.)*.
**warming pan,** تاوەی گەرمکەرەوە: تاوەیەکی کلک درێژی سەرقاپدارە
پشکۆی ئاگر یا ئاوی گەرمی تێدەکرا بۆ جێ گەرمکردنەوە پێش نوستن.
**warmish** (wôrm′ish), *adj.* نەختێک گەرم.
**warmonger** (wôr′muŋ′gẽr), *n.* شەڕپەرست؛ شەڕخواز؛
دەڵاڵی جەنگ؛ بازرگانی جەنگ.
**-warmongering** *(adj. & n.)*.
**warmth** (wôrmth), *n.* (١) گەرمی؛ گەرمایی.
(٢) هەست گەرمی؛ خوێن گەرمی؛ سۆزی دڵ؛ بەجۆشی؛ هەستی بەتین
(٣) ئەو هەستە گەرمەی پەیدا دەبێ لە بەکارهێنانی شتی سووررو پرتەقاڵی‌یەوە.
**warm-up** (wôrm′up′), *n.* (١) مەشقی هێواشی خۆ ئامادەکردن
بۆ پێشبڕکێ:
*(The spectators watched the players go through their ~s.)*
(٢) گەرم بوون (بۆ ڕووداوێکی گرنگ)؛ ئامادەکاری‌و وورده وورده جۆشدان بۆ
گەرم بوون بۆ ڕووداوە سەرەکی‌یەکە.
**warn** (wôrn), *v.t.* (١) وورپاکردنەوە:
*(We ~ed him of the danger.)*
(٢) ئامۆژگاری کردن؛ سەرنج ڕاکێشان بۆ:
*(You have been ~ed against smoking here.)*
(٣) پێشەکی پێ ووتن؛ پێشەکی پێ ڕاگەیاندن.
(٤) پێ ڕاگەیاندن یا پێ ووتن بۆ ئامادەبوون‌و چوون بۆ شوێنێکی تایبەتی لە
کاتێکی دیاریکراودا.
*v.i.* ئاگادارکردن؛ وورپاکردنەوە:
*(A rattlesnake ~s before it strikes.)*
**warning** (wôr′niŋ), *n.* ئاگاداری؛ وورپاکردنەوە؛ ئامۆژگاری؛
ڕاگەیاندن:
*(We gave him a ~. ; She paid no attention to my ~s.)*
*adj.* ئاگادارکەرەوە؛ وورپاکەرەوە؛ هی ئاگاداری یا وورپاکردنەوە:
*(He gave a ~ look . There were many ~ signals.)*
**-warningly** *(adv.)*.
**warp** (wôrp), *n.* (١) (ا) شێوان؛ شێوە تێکچوون؛ قوپان؛ خواربوون؛
لاربوون. (ب) پێچ؛ قوپاوی؛ پێچاوپێچی؛ خواری؛ لاری؛ چەوتی.
(٢) مێشک شێوان؛ خوو یا کردەوەی سەیر؛ ناوێزەیی مێشک.
(٣) لیتەی لە دوای ڕووبارەوە جێماو
(٤) گوریس یا پەتی کەشتی ڕاکێشانە لەنگەرگاوە.
(٥) تان؛ ڕێسمانی باری درێژی چنراو.
*v.t.* (١) چەماندنەوە؛ خوارکردن؛ لارکردن؛ خواروخێچ کردن؛ قوپاندن؛
چەوت کردن (٢) (ا) لە ڕێی خۆ لادان.
(ب) تێکدان؛ شێواندن *(a ~ed wind)*.
(ج) شێواندن؛ بە هەڵە لێکدانەوە؛ گۆڕین:
*(a ~ed statement; ~ed ideas; He ~ed the facts.)*
(٣) پێکەوەبەستن (بە بەن یا پەت): *(W~ two sticks together.)*
(٤) باڵی فڕۆکە چەماندنەوە بۆ هاوسەنگی.
(٥) ڕاکێشانی کەشتی بە پەت یا گوریس.
(٦) تان کردن؛ دانانی ڕێسمانی باری درێژی چنراو.
*v.i.* (١) خواروخێچ بوون (تەختەو دار)؛ چەوت بوون؛ قوپان؛ خواربوون:
*(The board is ~ed.)*
(٢) (ا) تێکچوون؛ شێوان؛ گۆڕان؛ چەوت بوون.
(ب) لە ڕێی ڕاستی خۆ لادان.
(٣) بە پەت ڕاکێشرانە لەنگەرگاوە (کەشتی).

-warper *(n.)*.
**war paint,** (١) بۆیەی جەنگ: بۆیەیەکە هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکان لە
لە دەموچاوو لەشیان دەدا پێش چوونە شەڕەوە.
(٢) [Slang]، جل‌وبەرگی ڕەسمی بە هەموو نەخش‌و نیشانەوە.
(٣) [Slang]، ئارایشت: سووراو و سپیاو.
**warp and woof,** تان‌و پۆ (چنین): بنچینە: بناغە
**warpath** (wôr′path′, wôr′päth′), *n.* ڕێڕەوی جەنگ.
ئەو ڕێڕەوەیە کە هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکان دەیگرن لە هێرش بردندا.
**on the warpath,** (١) ئامادەیە بۆ جەنگ: شەڕفرۆش: جەنگاوەر:
شەڕانی. (٢) تووڕە.
**warplane** (wôr′plān′), *n.* فڕۆکەی جەنگ
**warrant** (wôr′ənt, wär′ənt), *n.* (١) ڕێ پێدان: پەسەندنامە.
(٢) بەڵگەی کارێک: هۆ. (٣) بەڵگەنامە: گەواهی.
(٤) (ا) سەنەد: قەواڵە.
(ب) [British]، ڕەسیدی شتومەك دانان لە بارخانە یا عەماردا.
(ج) دەسەڵاتنامەی گرتن یا پشکنین... هتد:
*( a search ~ ; The police had a ~ for his arrest. an arrest ~ )*
(د) بڕوانامەی دانان بە جێگری ئەفسەر
*v.t.* (١) دەستەبەری کردن: سەنەد دان:
*( This material is ~ed to be pure silk.;*
*I'll ~ him an honest and reliable man.)*
(٢) دەسەڵات پێدان: ڕێ پێدان (یاساگەری)
(٣) بە ڕەوا بینین: شایستەبوون:
*( Nothing can ~ such harsh treatment.)*
(٤) دەستەبەری کردن بە لەسەر تاپۆکردنی خانوو
(٥) [Colloq.]، بە دڵنیایی‌یەوە ووتن: بێ گومان بوون:
*( I ~ he will be late.)*
**warrantable** (wôr′ən-tə-b'l, wär′ən-tə-b'l), *adj.* بەڵگەدار:
هۆدار: ڕەوا
**warrantee** (wôr′ən-tē′, wär′ən-tē′), *n.* دەستەبەری پێدراو
**warrant officer,** جێگری ئەفسەر
**warrantor** (wôr′ən-tēr, wär′ən-tēr), *n.* *Also* warranter,
دەستەبەر
**warranty** (wôr′ən-ti, wär′ən-ti), *n.* (١) دەسەڵاتنامە:
پەسەندنامە (ڕێ پێدان (٢) بەڵگەنامە: بەڵگە: هۆ
(٣) دەستەبەری (ا) لە فرۆشیارەوە کە فرۆتەنی‌یەکەی ساختەی تێدا نی‌یە.
(ب) لە کڕیارەوە کە ئەو زانیاری‌یەی داوێتی دەربارەی خۆی ڕاستە.
(ج) لە فرۆشیاری خانوو زەوی‌وزارەوە کە تاپۆکە هی خۆیەتی.
(٤) فەرمان یا دەسەڵاتنامەی گرتن یا پشکنین... هتد.
**warren** (wôr′ən, wär′ən), *n.* (١) پەروەردگای گیانداری بچووکی
ڕاو. (٢) (ا) کولانەی کەروێشك (بە خەنەقی ژێر زەمینەوە)
(ب) کۆمەڵە کەروێشك. (٣) خانوویەکی پڕ گەڕەکێك یا شوێنێکی قەرەباڵغ
**warrener** (wôr′ən-ēr, wär′ən-ēr), *n.* خاوەن یا چاودێری
پەروەردگای گیانداری بچووکی ڕاو.
**warrior** (wôr′i-ēr, wär′yēr), *n.* جەنگاوەر: شەڕکەر:
جەنگاوەری قاڵ
**warsaw** (wôr′sô), *n.* جۆرە ماسی‌یەکی گەورەی دەریا گەرمەکانە
**warship** (wôr′ship′), *n.* کەشتی جەنگ
**warsle** (wär′s'l), *v.t.* *Also* warstle, زۆران لەگەڵ گرتن
هەوڵدان: تێ‌کۆشین کردن
**wart** (wôrt), *n.* (١) مێخەکە: بالووکە
(٢) فوورتی سەر لاسکی ڕووەك
(٣) [Colloq.]، کەسێکی بۆگەنی کەس خۆش نەویستوو
**wart hog,** جۆرە بەرازە کێوی‌یەکی ئەفەریقایی‌یە
**war-time** (wôr′tīm′), *n.* سەردەمی جەنگ: کاتی شەڕ

**warty** (wôr′ti), *adj.* (١) بالووکاوی: مێخەکەدار: مێخەکاوی.
(٢) لە بالووکە یا مێخەکە دەچێ.
**war whoop,** هاواری جەنگ (بەتایبەتی لای هیندی‌یە ئەمەریکایی‌یەکان).
(ووشەی " war cry " ببینە).
**wary** (wâr′i), *adj.* (١) ووریا: بە ترس: بە ئاگا (بۆ نەکەوتنە داو یا
هەڵەوە): *( a ~ individual)* .
(٢) ووریایانە: لە ترس یا ووریایی‌یەوە هاتووە: *( a ~ look)* .
-warily *(adv.)*; wariness *(n.)*.
**wary of,** لێ بەگومان بوون: لێ بەترس بوون: ووریای شتێك یا کەسێك بوون.
**war zone,** ناوچەی جەنگ: ناوچەی شەڕ
**was** (wuz, wäz; *unstressed* wəz), *the first and third person singular, past tense of* **be.**
**wash** (wôsh, wäsh), *v.t.* (١) شتن: شۆردن: شتنەوە: شۆردنەوە.
(٢) پاك کردنەوە: خاوێن کردن. (٣) تەڕکردن: لە ئاو هەڵکێشان.
(٤) شۆردنەوە (شەپۆل، ڕووبار، دەریا): داپۆشین: بەسەردا ڕۆیشتن.
(٥) (ا) ( ~ off; ~ out; ~ away )، ڕامالین:
*( The waves ~ed away the sand.)*
(ب) ( ~ away )، بردن: ڕامالین: *( The waves ~ed the stick away.)*
(٦) (ا) تێکردن (بە ڕامالین، بردن، یا کەندەلان کردن):
*( The rain ~ed gullies in the field.)*
(ب) ( ~ out; ~ away )، شتنەوە: ڕامالین: دامالین: بردن:
*( The flood ~ed out the road.)*
(٧) پێ شۆردن: پێ شۆران: *( That soap will ~ silks.)* .
(٨) بۆیەکردن. (٩) ڕووکەش کردن بە کانزا.
(١٠) بە گاز پاك کردنەوە: گاز لێدان
(١١) (ا) شتنەوەی کانزای خاوو بەردو زیخ‌و خۆڵ (بۆ جیاکردنەوەی کانزاکە)
(ب) جیاکردنەوەی کانزا بەم شتنەوەیە.
*v.i.* (١) ( ~ up )، خۆشتن: دەست‌و دەموچاو شتن.
(٢) (ا) جل شتن: جل شۆردن. (ب) پاك کردنەوە: شتن: شۆردن.
(٣) شۆران بەبێ ڕەنگ چوونەوە یا چوونەوەیەك.
(٤) لێ بوونەوە (بە شتن): *( The stain ~ed out.)* .
(٥) ( ~ over; ~ against; ~ along )، پیامالین (شەپۆل):
خۆ پیادان‌و شتنەوە (شەپۆل)
(٦) ( ~ out; ~ away )، ڕامالران: ڕامالین: ڕووخان: ئاوبردن:
*( The bridge had ~ed out.)*
(٧) داخوران: دامالین: ڕامالین (بە بارانا و یا لافاو)
(٨) [British Colloq.]، خۆ لەبەر تاقیکردنەوە یا شیکردنەوەدا ڕاگرتن:
بەرگەگرتن: *( His story won't ~.)* .
*n.* (١) شتن: شۆردن. (٢) جل‌وبەرگی بە یەك جار شۆراو: جلی شتن
(٣) چڵکاو: شلەی بەرماوە (کە دەدرێ بە بەرازی ماڵی)
(هەروەها " hogwash " وە " swill " ) .
(٤) (ا) شەپۆل هەڵسان. (ب) هاژەی شەپۆل. (ج) لێشاو
(د) گێژاوی دوای سەوڵ‌و چەرخی سەوڵ لێدان... هتد
(٥) ڕامالینی خاك بەهۆی شەپۆل‌و لافاوەوە. (٦) لیتەی ڕووبار
(٧) زیخ‌و خۆڵی تێکەڵاو بە کانزای خاو کە دادەشۆرێت.
(٨) (ا) نزمە زەوی زوو زوو لافاو لێ هەڵنیشتوو پڕ لە چاڵاو.
(ب) زۆنگاو: زەلکاو. (ج) گۆمی تەنك: ئەستێرك: ئەستێل.
(د) زێ یا لقی تەنکی ڕووبارو دەریا
(٩) ئاوەڕۆ: خەنەقی بە ئاو درووست بوو
(١٠) بنی ڕووبار یا شیوی لە هاوینا ووشك بوو
(١١) بۆیەی لە تابلۆ دراو بە تەنکی
(١٢) شلەی کانزایی‌یە بۆ تێهەڵسوون لە ڕوویەك‌و ڕووکەش کردنی
(١٣) شلەی جۆراوجۆر (بۆ مەبەستی ئارایشت، پزیشکی، شتن... هتد)
*( a hair ~ ; a mouth ~ )*
(١٤) خواردنەوەی مەستکەری ئامادە بۆ کردنە شووشەوە.

(١٥) شلەو شۆرباو چاو خواردنەوەی تری ڕوون و بێ تام.
[ *This soup ( juice, tea, coffee ) is mere ~ .* ]
(١٦) ئاو یا شلەی شۆردن.
(١٧) [Colloq.] ئاو یا ساردەمەنی‌یەکە دەخورێتەوە پاش خواردنەوەی ویسکی خەست و خواردنەوەی مەستکەری تر بۆ بردنە خوارەوەی.
*adj.* دەتوانری بشۆری بەبێ چوونەوەیەك یا ڕەنگ چوونەوە: *( a ~ dress)* .
**come out in the wash.** [Slang]. (١) ئەنجام چاك بوون؛ بە باشی دوایی هاتن؛ بە باشی گەڕان.
*( The situation may look hopeless now, but it will all come out in the wash.)*
(٢) دەرکەوتن؛ هاتنەڕوو درەنگ بێ یا زوو
**wash down,** (١) شۆردن سەراپا (بە ئاوی خوڕ):
*( to wash down a car)*
(٢) ئاو یا خواردنەوەی تر کردن بەسەر پارووە ئاندا بۆ بردنە خوارەوەی.
**wash one's hand of,** دەست لێ شتن؛ هیوا پێ نەمان.
**wash out,** (١) شتنی ئەوەوەی شتێك. (٢) ڕامالین؛ ئاوبردن(پرد، ڕێگە).
(٣) [Slang]، دەرنەچوون و دەرکران (لە قوتابخانە).
(٤) [Slang]، فڕۆکە تێکشکاندن بە تەواوی (لە نیشتنەوەدا)
**wash up,** (١) خۆشتن (٢) [British Colloq.]، قاپ‌وقاچاغ شتن.
**washable** (wôsh′ə-b'l, wäsh′ə-b'l), *adj.* دەشۆرێت بێ ئەوەی بچێتەوە یەك یا ڕەنگی بچێتەوەو بفەوتێ.
**wash and wear,** بشۆرو بپۆش؛ دەشۆرێت و لەبەر دەکرێ بێ ئوتودان:
*( ~ pants, shirts, etc.)*
**wash-basin** (wôsh′bā′s'n), *n.* [Chiefly British],
**wash-bowl.**
**washboard** (wôsh′bôrd′, wäsh′bōrd′), *n.* (١) تەختەی شتن تەختەیەکی کرنج کرنجە بۆ جل لەسەر هەڵگلۆفین و شتن.
(٢) تەختەیەکە بە قەراغی بەلەمەوە بۆ بەربەستکردنی شەپۆل.
(٣) تەختەدارێکی باریکە بە بنی دیواری ژووردا.
**wash-bowl** (wôsh′bōl′, wäsh′bōl′), *n.* دەستشۆر: حەوزۆچکەی دەست و دەم‌وچاو شتن.
**wash-cloth** (wôsh′klôth′, wäsh′klôth′), *n.* لفکە؛ پەڕۆیەکە خوی پێ دەشۆرێ وەك لفکە.
**wash-day** (wôsh′dā′, wäsh′dā′), *n.* ڕۆژی جل شتن
**washed-out** (wôsht′out′, wäsht′out′), *adj.* (١) کاڵ بووەوە؛ ڕەنگ چووەوە؛ چووەوە. (٢) [Colloq.]، ماندوو؛ پەککەوتوو؛ لاواز؛ بێ هێز؛ ڕەرد هەڵگەڕاو.
**washed-up** (wôsht′up′, wäsht′up′), *adj.* (١) شۆراو؛ پاك؛ پاك کراوەتەوە (٢) [Colloq.]، ماندوو؛ پەککەوتوو.
(٣) [Slang]، فەوتاو؛ بێ برەو؛ بەکار نەماو؛ سەرنەکەوتوو؛ لێ خراو.
**washer** (wôsh′ēr, wäsh′ēr), *n.* (١) بشۆر
(٢) واشەر ئەڵقەیەکی لاستیکی تەنکە دەخرێتە نێوان دوو بۆڕی ئاسنەوە بۆ لەیەك نەدانی ئاسنەکان و تکە نەکردن.
(٣) مەکینەی جل یا قاپ‌وقاچاغ شتن
**washer-man** (wôsh′ēr-mən, wäsh′ēr-mən), *n.* پیاوی جل شۆر (بە پارە)
**washer-woman** (wôsh′ēr-woo′mən), *n.* ئافرەتی جل شۆر (بە پارە)
**washing** (wôsh′iŋ, wäsh′iŋ), *n.* (١) شتن؛ شۆردن
(٢) هەڵکیشان لە ئاو یا شلەی تر
(٣) (ا) ( ) ئاوی شت پێ شۆراو. (ب) چڵك و پیسی بە شتن لێکراوە.
(٤) (ا) ڕامالین بە ئاو، لافاو، لێشاو، شەپۆل... هتد.
(ب) خاك و لم و زیخ و شتی تری ڕامالراو.
(ج) کانزای خاوی دەرهێنراو لە لم و زیخ و خۆڵ بە شۆردنەوە
(٥) کانزای ڕووکەش پێکراو؛ ڕووکەشی کانزا.
(٦) جلی شتن (بە یەك جار).
*adj.* هی شتن؛ هی شۆردن؛ بۆ شتن بەکارهێنراو.
**washing machine,** مەکینەی جل شتن؛ جل شۆری کارەبایی.
**wash-out** (wôsh′out′, wäsh′out′), *n.* (١) ڕامالینی خاك و زیخ و بەرد بە لافاو (وەك هی ڕێگەوبان).
(٢) خەنەق و کەندری دروست بوو بەم ڕامالینە.
(٣) [Slang]، کەسێکی سەرنەکەوتوو (بەتایبەتی لە خوێندندا)؛ کەسێکی بوودەڵەو ناکارامەو هیچ لە باردا نەبوو.
(٤) [Slang]، سەرنەکەوتن؛ ژێرکەوتن؛ شکستی؛ ناکامی.
**wash-rag** (wôsh′rag′, wäsh′rag′), *n.* = ′*n.* ژووری ئاودەست و دەست و دەم‌وچاو شتن (بەتایبەتی لە شوێنی گشتی وەك چێشتخانەدا)؛ ئاودەست و دەستشۆر.
**washstand** (wôsh′stand′, wäsh′stand′), *n.* (١) چوارچێوەی مەسینەو لەگەن لەسەر دانان. (٢) چوارچێوەی دەستشۆری بەلووعەدار
**washtub** (wôsh′tub′, wäsh′tub′), *n.* حەوزۆچکەی جل شتن: تەشت یا بانیۆی جل شتن.
**washwoman** (wôsh′woom′ən), *n.* = **washerwoman.**
**washy** (wôsh′i, wäsh′i), *adj.* (١) ڕوون؛ ڕوون و بێ تام: *( ~ tea, coffee, soup, etc.)* .
(٢) کاڵ؛ ڕوون (بۆیە).
(٣) لاواز؛ سست؛ بێ هێز؛ خاو؛ بێ تین.
**wasn't** (wuz′'nt, wäz′'nt), = **was not.**
**wasp** (wäsp, wôsp), *n.* (١) زەردەواڵە؛ شەنگە سوورە.
(٢) (ا) کەسێکی ناوقەد باریك. (ب) کەسێکی سەرگەرم یا تووڕەوتڕۆ
**waspish** (wäsp′ish, wôsp′ish), *adj.* (١) زەردەواڵەیی.
(٢) ناوقەد باریك. (٣) سەرگەرم؛ زووهەڵچوو؛ زوو ووروژاوە؛ تووڕە.
-**waspishly** *(adv.)*; **waspishness** *(n.)*.
**wasp waist,** ناوقەدی زەردەواڵە؛ ناوقەدی باریك.
-**wasp-waisted** *(adj.)*.
**waspy** (wäsp′i, wôsp′i), *adj.* زەردەواڵەیی؛ لە زەردەواڵە دەچێ.
**wassail** (wäs′'l, was′'l, wäs′āl), *n.* (١) نۆش! (بۆ خواردنەوە)
(٢) واسل: خواردنەوەیەکی مەستکەری ئینگلیزی‌یە.
(٣) ئاهەنگی خواردنەوە.
(٤) [Obs. or British Dial.]، گۆرانی‌یەکی خواردنەوەیە.
*v.i.* واسل خواردنەوە
*v.t.* واسل خواردنەوە بە خۆشی یەکێکەوە.
-**wassailer** *(n.)*.
**Wassermann test** ( or **reaction** ), تاقیکردنەوەی واسەرمان: تاقیکردنەوەیەکە بۆ دەرخستنی ئاتەشەك یا " سفلس " تووش بوون
**wast** (wäst; *unstressed* wəst), *archaic second person-singular past of* **be.** شێوەی کۆنی " **was** " ە لەگەڵ " **thou** " (واتە، تۆ) بەکاردەهێنرێ: ( **thou wast** ) .
**wastage** (wās′tij), *n.* (١) لەناوچوون؛ لێ کەم بوونەوە؛ نەمان
(٢) بە فیڕۆدان؛ فیڕۆ: *( the ~ of time and money)* .
(٣) شتی بەفیڕۆدراو؛ شتی فڕێدراو.
(٤) توانەوەی شاخی بەفرو سەهۆڵ.
**waste** (wāst), *v.t.* (١) وێران کردن؛ کاوڵ کردن.
(٢) بەکارهێنان و بەرەبەرە هیچ نەهێڵانەوە؛ لەناوبردن
(٣) پووکاندنەوە؛ لاوازکردن (نەخۆشی، پیری... هتد)؛ تین تێدا نەهێشتن
(٤) بە فیڕۆدان؛ بەربادکردن؛ بە بادان
(٥) لە دەست خۆ دان؛ لە کیس خۆ دان.
*( You ~d a good opportunity.)*
*v.i.* (١) ( **~ away** )، پووکانەوە (نەخۆشی، پیری)؛ لاوازبوون؛ هێز تێدا نەمان: *( He ~d away because of tuberculosis.)*
(٢) کەم بوونەوە بەرەبەرە؛ فەوتان؛ لەناوچوون؛ بەربادکران.

(۳) [Rare]، تێپەڕین (کات)؛ بردنە سەر.

(٤) بەفیڕۆچوون؛ بەفیڕۆدران

**adj.** (۱) چۆڵ بەرەڵا؛ نەچێنراو؛ نەکێڵراو؛ سوود لێ وەرنەگیراو؛ ڕووتەنی؛ بەیار: ***( ~ land)*** .

(۲) پاشەڕۆك؛ فڕێدراو؛ بێ کەڵك: ***( a ~ product; ~ paper)*** .

(۳) بەفیڕۆدراو؛ بەکارنەهێنراو؛ زیادە: ***( ~ energy)*** .

(٤) لە لەش دێتە دەرەوە (میزو گوو)؛ لەش دەیکاتە دەرەوە

(٥) (ا) پیسایی بەر؛ شتی پیس دەبات: ***( a ~ pipe)*** .

(ب) شتی پیسی تێ دەکرێ، هی زبڵ یا پاشەڕۆك: ***( a ~ basket)*** .

**n.** (۱) زەوی بەرەڵاو سوود لێ وەرنەگیراو؛ بیابان؛ ڕووتەنی؛ دەشت.

(۲) کەلاوە؛ شوێنێکی وێران کراو؛ وێرانە:

***( Berlin was a ~ of tumbled walls.)***

(۳) (ا) بەفیڕۆدان؛ بەفیڕۆچوون؛ بە بادان؛ بەربادکردن.

(ب) لە دەست خۆ دان؛ لە کیس خۆ دان.

(ج) بەرەبەرە لەناوچوون؛ کەم بوونەوە؛ سوان؛ داڕزان؛ فەوتان.

(٤) پاشەڕۆك؛ زبڵ؛ شتی بێ کەڵکی فڕێدراو.

(٥) میزو گوو؛ پیسایی (٦) وێرانکاری (جەنگ)؛ وێران کردن

(۷) شتی ڕامالراو بە ڕووبارو لافاوو دەریاوە.

**go to waste,** بەفیڕۆچوون؛ بەفیڕۆدران.

**lay waste,** وێران کردن (جەنگ، لافاو).

**waste one's breath ( or words ),** قسەی خۆ لەبەرد دان؛ قسەی خۆ بەفیڕۆدان.

**wastebasket** (wāst′bäs′kit), ***n. Also*** **wastepaper basket,** تەنەکەی زبڵ؛ سەبەتەی کاغەزو شتی فڕێدراو.

**wasted** (wās′tid), ***adj.*** (۱) (ا) سوود لێ وەرنەگیراو؛ بەکارنەهێنراو: ***( ~ energy)***

(ب) بەفیڕۆچوو؛ بەفیڕۆدراو: ***( a ~ life)*** .

(۲) بێ کەڵك؛ زیادە؛ بەفیڕۆدراو: ***( ~ words)***

(۳) وێران کراو؛ کاول کراو

(٤) ڕەنگ زەردو لاوازو ماندوو و قوپاو (بە نەخۆشی)؛ فەوتاو؛ پووکاوە:

***( a ~ body, face, etc.)***

(٥) [Obs.]، تێپەڕبوو؛ بەسەرچوو؛ ڕۆیبوو (کات).

**wasteful** (wāst′fəl), ***adj.*** (۱) دەستبڵاو؛ دەست بە قرپ؛ بەفیڕۆدەر:

***( a ~ woman, society, etc.)***

(۲) وێرانکەر؛ کاولکەر؛ فەوتێنەر.

**-wastefully** ***(adv.)***; **wastefulness** ***(n.).***

**wasteland** (wāst′land′), ***n. Also*** **waste land,** وێرانە؛ وێرانە زەوی؛ چۆڵەوانی؛ ڕووتەنی.

**wastepaper** (wāst′pā′pēr), ***n. Also*** **waste paper,** کاغەزی بێ کەڵکی فڕێدراو

**waste pipe,** بۆری پیساو؛ بۆری زێراب؛ بۆری پیسایی.

**waster** (wās′tēr), ***n.*** پارە بەفیڕۆدەر؛ دەستبڵاو؛ پارە بە بادەر.

**wasting** (wās′tiŋ), ***adj.*** (۱) بەناخداچوو؛ بەرەبەرە فەوتاو؛ لەناوچوو ***( the ~ countryside of America)*** .

(۲) وێرانکەر؛ کاولکەر؛ فەوتێنەر: ***( ~ war)***

(۳) لاوازکەر؛ پووکێنەرەوە؛ لەڕولاوازکەر؛ بێ تێن کەر؛ ووشککەرەوە:

***( a ~ disease)***

**wastrel** (wās′trəl), ***n.*** (۱) کەسێکی پارە بەفیڕۆدەر؛ کەسێکی دەستبڵاو یا دەست بە قرپ. (۲) کەسێکی بێ فەڕ؛ کەسێکی قەڵب و نالەبار.

**watch** (wäch, wôch), ***n.*** (۱) ووریایی؛ ئاگاداربوون؛ بە ئاگایی؛ هۆشیاری (۲) بەشێکی شەو

(۳) چاودێری؛ چاوپێوەبوون؛ ئاگاداری؛ ئاگاداری کردن:

***( Keep a close ~ over the baby.)***

(٤) پاسەوان (بەتایبەتی هی شەو)؛ نۆبەچی؛ حەسحەس؛ ئێشکچی؛ ئێشکگر.

(٥) (ا) نۆبەی پاسەوان یا نۆبەچی (ب) پاسەوانگا؛ جێی پاسەوان یا نۆبەچی.

(٦) کاتژمێری دەست و بەرباخەڵ؛ کاتژمێر.

(۷) [Obs.]، ئێشکی مردوو؛ ئێشکگرتن.

(۸) [Obs.]، مۆمی نیشانەکراو بە بەش بەشەوە بۆ کات ڕاگرتن.

(۹) [Obs.]، تێخوڕینی پاسەوان.

(۱۰) (ا) نۆبەی ئێشکردنی کەشتیوانەکانی کەشتییەك.

(ب) کەشتیوانی هاونۆبە. (ج) کاتژمێری کەشتی

***v.i.*** (۱) ئێشکگرتنی ئایینی؛ ئێشکگرتن بۆ نوێژکردن و خواپەرستی

(۲) پاسەوانی کردن؛ نۆبەچێتی کردن.

(۳) چاودێری کردن؛ چاو لێوە بوون؛ ئاگاداری کردن؛ ئاگا لێ بوون؛ پاراستن.

(٤) سەیرکردن؛ تەماشاکردن: ***( Most people just ~ed.)*** .

(٥) ( **~ for** )، چاوەڕێ کردن؛ بەتەمابوون: ***( W~ for your chance.)*** .

***v.t.*** (۱) پاسەوانی کردن؛ ئێشکگرتن؛ پاراستن.

(۲) سەرنجدان بە ووردی؛ سەیرکردن بە ووردی؛ چاو تێ بڕین.

(۳) سەیرکردن بۆ فێربوون و ئاگاداری.

(٤) چاوەڕێ کردن؛ بەتەمابوون: ***( W~ your chance.)*** .

(٥) چاودێری کردن؛ ئاگاداری کردن؛ چاو لێوە بوون؛ بە دیارەوە بوون.

**on the watch,** گوێ قوڵاخ بوون؛ چاوەڕوان کردن بە پەرۆشەوە.

**watch out,** ووریابوون؛ ئاگا لە خۆ بوون.

**watch over,** پاس کردن؛ چاودێری کردن؛ بە دیارەوە بوون؛ ئاگاداری کردن:

***( She watched over us like a mother hen over her brood.)***

**watchband** (wäch′band′, wôch′band′), ***n.*** زنجیر یا قایشی کاتژمێر.

**watch cap,** کڵاوی سەربازی دەریایی (بۆ سەرما).

**watchcase** (wäch′kās′, wôch′kās′), ***n.*** قەپاغ و چوارچێوەی کاتژمێر.

**watch chain,** زریزەی کاتژمێری بەرباخەڵ.

**watchdog** (wäch′dôg′, wôch′dôg′), ***n.*** (۱) سەگی پاسەوان؛ سەگی پاس. (۲) پاسەوان ( هی دەستدرێژی و بەدکاری و چەوتی ... هتد)؛ پارێزەر: ***( a self- appointed ~ of public morals)*** .

**watcher** (wäch′ēr, wôch′ēr), ***n.*** (۱) شەونخوون.

(۲) پاسەوان؛ نۆبەچی؛ چەرخەچی (۳) ئێشکگری مردوو.

(٤) ئێشکگری نەخۆش. (٥) چاودێر؛ سەیرکەر.

(٦) نوێنەر یا چاودێری حیزبێك یا کەسێکی نامزەدکراو لە مەڵبەندی دەنگداندا لە ڕۆژی هەڵبژاردندا.

**watch fire,** ئاگری پاسەوانی؛ ئاگری پاسەوانان.

**watchful** (wäch′fəl, wôch′fəl), ***adj.*** (۱) ووریا؛ ئاگادار؛ چاو نەترووکێن؛ هۆشیار؛ بەئاگا: ***( a ~ guard; a ~ eye)*** .

(۲) [Archaic]، بێ خەو؛ خەوزڕاو؛ شەونخوون.

**-watchfully** ***(adv.)***; **watchfulness** ***(n.).***

**watch glass,** شووشەی کاتژمێر.

**watch guard,** زریزەی کاتژمێری بەرباخەڵ

**watchmaker** (wäch′māk′ēr, wôch′māk′ēr), ***n.*** سەعاتچی.

**watchman** (wäch′mən, wôch′mən), ***n.*** (۱) پاسەوان (هی کارگەو خانوو و فرۆشگا ... هتد).

(۲) حەسحەس؛ ئێشکگر؛ پاسەوان؛ چەرخەچی؛ نۆبەچی.

**watch night,** (۱) شەوی سەری ساڵ. (هەروەها **" New Year's Eve "**).

(۲) نوێژی سەری ساڵ بە کۆمەڵ لە کڵێسەدا.

**watch pocket,** باخەڵی کاتژمێر.

**watch-tower** (wäch′tou′ēr, wôch′tou′ēr), ***n.*** قوللەی چاودێری (بۆ چاودێری جموجووڵی دوژمن، بەندی بەندیخانە، دارستان لە ترسی ئاگر).

**watchword** (wäch′wûrd′, wôch′wûrd′), ***n.*** (۱) **password**.

(۲) درووشم: ***( Let our ~ be freedom.)*** .

**water** (wô′tẽr, wät′ẽr), *n.* (١) ئاو
(٢) (*pl.*) دەریا؛ دەریاچە؛ ڕووبار؛ گۆم.
(٣) (أ) قووڵی ئاو. (ب) ڕووی ئاو: ***( above ~ ; under ~ )***
(ج) ئاستی ئاو (لە ڕووبار یا دەریادا): ***( high ~ ; low ~ )*** .
(٤) ئاوتێهاتنی بەلەم و کەشتی
(٥) ئاراو: جارێك ئاو پێداکردن:
***( Diapers must be rinsed in three ~s .)***
(٦) (*pl.*) ئاوی کانزایی (بۆ مەبەستی پزیشکەوانی).
(٧) (أ) میز. (ب) لیك؛ فرمێسك؛ شلاوی پەنکریاس.
(ج) ئاوی منداڵدان
(٨) ئاوی گازاوی یا کانزایی: ***( mineral ~ ; ammonia ~ )*** .
(٩) (أ) بریقەو ڕوونی بەردی بەنرخ: ***( a diamond of the first ~ )*** .
(ب) لێهاتوویی: نایابی؛ باشی: ***( an artist of the first or purest ~ )*** .
(١٠) ڕووی ساف و بریقەدارو شەپۆل ئاسایی ئاوریشم و تەبەقە کانزا.
(١١) تابلۆی بۆیەی ئاوی.
(١٢) (أ) هەڵسەنگاندنی سەرمایەی کۆمپانیایەك بە زیاتر لە سەرمایەکەی خۆی.
(ب) دەرکردنی قەواڵەی دارایی بەپێی ئەم هەڵسەنگاندنە زۆرە.
*v.t.* (١) گیانەوەر ئاودان: ***( to ~ the flock)*** .
(٢) ئاودار: ئاوپێدان: ***( Large tanks were there to ~ the troops.)*** .
(٣) ئاودار (زەوی‌وزار، دارودرەخت): ***( to ~ the plants)*** .
(٤) ئاو بۆ ڕاکێشان (بە جۆگە، خەنەق... هتد)؛ ئاو بۆ هێنان.
(٥) ئاوڕشێن کردن؛ ئاو پیاکردن؛ تەڕکردن؛ خووساندن
(٦) ئاو تیکردن: ڕوونکردنەوە: ***( She ~s down the juice.)*** .
(٧) دیمەنێکی بریقەدارو شەپۆل ئاسایی پێدان (ئاوریشم).
(٨) قەواڵەی دارایی زیادە خستنە بازاڕەوە بەبێ زیادکردنی سەرمایە.
*v.i.* (١) ئاوکردن (چاو): ***( Her eyes ~ when she chops onions.)*** .
(٢) ئاوکردن (دەم)؛ ئاو تێزانە دەمەوە:
***( His mouth ~s at the sight of food.)***
(٣) ئاو لەگەڵ خۆ بردن.
(٤) ئاو خواردنەوە
*adj.* (١) ئاوی: تایبەتی بە ئاو؛ بۆ ئاو.
(٢) ئاوی: لە ئاودا دەکرێ: ***( ~ sports)*** .
(٣) ئاوی: لە ئاودا دەژی: ***( ~ plants; ~ birds)*** .
(٤) (أ) بە ئاو دەگەڕێ یا ئیشی پێ دەکرێ: ***( a ~ wheel)*** .
(ب) ئاوی: لە ئاو دروست دەکرێ یا پەیدا دەبێ (کارەبا): ***( ~ power)*** .
(٥) ئاوی تێزاوە؛ ئاوی تێدایە: ***( a ~ blister)***
(٦) ئاوی تێ دەکرێ (بۆ ڕوونکردنەوە یا ڕەق بوون).
(٧) هی ئاو؛ ئاو: ئاو لەژێر سایەیایەتی: ***( ~ gods)*** .
**above water,** لە تەنگ و چەڵەمە بەدەر؛ بێ سەرئێشە؛
لە ناخۆشی و گیروگرفت ڕزگاربوو.
**by water,** بە کەشتی یا بەلەم.
**get into hot water,** تووشی تەنگ و چەڵەمە بوون؛ گرفتار بوون؛
تووشی ناخۆشی بوون.
**hold water,** (١) ئاوی لێ ناچێ؛ ئاوی لێ ناتکێ.
(٢) بەجێ: ڕاست (بیروڕا)؛ خۆی ڕادەگرێ لەبەر تاقیکردنەوەدا:
***( Your theory does not hold water.)***
**in deep water(s),** تووشی گیروگرفتێکی خراپ بوون؛
تووشی ناخۆشی‌یەکی زۆر بوون.
**keep one's head above water,** خواخوای پێ دانەچوون بوون
(لەڕووی گوزەرانەوە)؛ بەهیوای بەرگەگرتن بوون و گیروگرفت نەبوون (گوزەران).
**like water,** وەك ئاو: پارە خەرج کردن)؛ دەستبڵاو؛ دەست بە قرپ:
***( He spends money like water.)***
**make one's mouth water,** دەم ئاوکردن؛ ئاو تێزانە دەمەوە؛
زۆر خۆش دیاربوون.
**make ( or pass ) water,** میزکردن

**throw cold water on,** ئاوی سارد بەسەردا کردن؛ پشت ساردکردنەوە؛
تێکدان (پیلان، ئاهەنگ... هتد):
***( He threw cold water on our travel plans.)***
**water under the bridge ( or over the dam ),** کاری لە کار
ترازاو؛ شتی لە دەست چوو؛ شتی بەسەرچوو و نەگەڕاوە.
**water adder,** ماری ئاوی.
**waterage** (wô′tẽr-ij, wät′ẽr-ij), *n.* [British], (١) فرۆتەنی
گواستنەوە بە ئاودا، واتە بە کەشتی و بەلەم. (٢) کرێی ئەم گواستنەوەیە.
**water ballet,** باڵێی ئاو: مەلەی یەکخراو و پێکەوە گونجاوی
چەند
مەلەوانێك.
**water beetle,** قالۆنچەی ئاوی.
**water bird,** باڵندەی ئاوی: باڵندەی ناو ئاوو زەلکاو و کەناردەریا.
**water biscuit,** پسکیتێکە لە ئاردو ئاو و ڕۆن دروست دەکرێ.
**water blister,** بلۆقی ئاو تێزاو؛ بلۆقی پڕ لە ئاو
**water-borne** (wô′tẽr-bôrn′), *adj.* (١) سەرئاوکەوتوو.
(٢) بە ئاو، واتە بە کەشتی گوێزراوە (بارگە).
(٣) لە ئاوی خواردنەوەی پیسەوە تووش دەبێ؛ ئاوهەڵگرتوو (میکرۆب):
*( ~ diseases, germs, etc.)*
**water boy,** ئاوگێڕ (بۆ دەستەیەك ئیشکەر، وەرزشکار... هتد).
**water-brain** (wô′tẽr-brān′, wät′ẽr-brān′), *n.* = **gid.**
**water brash,** = **heartburn.**
**waterbuck** (wô′tẽr-buk′, wät′ẽr-buk′), *n.* ئاسکی ئاوی:
جۆرە ئاسکێکی گەورەی شاخدارە لە نزیك و ڕووبارو زەلکاو دەژی
**water buffalo,** گامێشی ئاوی.
**water bug,** مێشوولەی ئاوی.
**water chestnut ( or caltrop ),** کەستەنەی ئاو (ڕووەك و بەر).
**water chinquapin,** (١) شلێری ئاوی ئەمەریکی.
(٢) تۆو یا بەری ئەم ڕووەکە (کە دەخورێت).
**water clock,** کاتژمێری ئاوی: کاتژمێرێکە کات دەژمێرێ بەهۆی
ڕۆیشتنی ئاوەوە بە کونێکدا (هەروەها " clepsydra ") .
**water closet,** ئاودەستخانە؛ ئاودەست؛ پێشاو؛ سەراو؛ تەوالێت.
(لە ئینگلتەرە پێی دەڵێن: " W.C ") .
**water color,** *Also* **water-color,** (١) بۆیەی ئاوی؛ ڕەنگی ئاوی:
بۆیەیەکە بە ئاو گیرابێتەوە نەك بە ڕۆن. (٢) تابلۆی بەم بۆیەیە کراو.
(٣) نیگارکێشان بەم بۆیەیە؛ نیگارکێشیی بۆیەی ئاوی.
-**water-color** *(adj.)*; **water-colorist** *(n.)*.
**water-cool** (wô′tẽr-kōōl′, wät′ẽr-kōōl′), *v.t.* ساردکردنەوە
بە ئاو (مەکینە).
**watercooler,** ئاوساردکەرەوە: کووپەیەکی شووشەیە بۆ ساردکردنی
ئاوی خواردنەوە.
**water-course** (wô′tẽr-kôrs′, wät′ẽr-kōrs′), *n.* (١) ڕووبار؛
جۆگە؛ چەم. (٢) ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕۆگە؛ چەمی دەستکرد؛ ئاوەڕێ.
(٣) بن یا بنکەی کوێرەچەم.
**water-craft** (wô′tẽr-kraft′, wät′ẽr-kräft′), *n.* (١) توانای
کەشتی و بەلەم لێخوڕین. (٢) مەلەوانێی؛ وەرزشی ناو ئاو؛ یاری ناو
(٣) کەشتی؛ بەلەم. (٤) کەشتی و بەلەم بەگشتی.
**water crake,** نوقمۆکە: باڵندەیەکی بچووکی قەراغ ئاوە.
(هەروەها " water ouzel ") .
**water cress,** کووزەڵە.
**water cure,** = **hydropathy; hydrotherapy.**
**water dog,** (١) سەگی حەز لەناو ئاو کەر. (٢) سەگی ڕاوی باڵندەی ئاوی.
(٣) قورناویلکە (٤) کەشتیوانی کۆن؛ کەسێکە کە زۆر حەز لەناو ئاو بکات.
**water down,** هێمن کردنەوە؛ خاوکردنەوە؛ لە توندوتیژی کەم کردنەوە:
***( He ~ his inflamatory speeches. a ~ report)***

**waterfall** (wô′tẽr-fôl′, wät′ẽr-fôl′), ***n.*** تاڤگە؛ ڕیژاو؛ سوڵاڤ

**waterfinder** (wô′tẽr-fīn′dẽr, wät′ẽr-fīn′dẽr), ***n.*** ئاو- دۆزەرەوە لە ژێرزەمیندا بە ڕەمڵ لێدان بە دارێکی دووفلیقانە. (هەروەها " dowser ").

**water flea,** کێچی دەریایی

**water-fowl** (wô′tẽr-foul′, wät′ẽr-foul′), ***n.*** باڵندەی دەریایی

**water-front** (wô′tẽr-frunt′, wät′ẽr-frunt′), ***n.*** (١) زەوی و خانووی قەراغ ڕووبارو دەریاچە (٢) گەڕەکی قەراغ ئاو یا نزیک بە ئاوی شار.
***adj.*** هی گەڕەکی سەر یا نزیک بە ئاو

**water gap,** چەمی ئاو ڕیزەشاخ.

**water gas,** گازی ئاوی گازێکی ژەهراوییە بۆ سووتەمەنی بەکاردێت.

**water gate,** = flood-gate.

**water guage,** (١) پێوەری ڕەوانیی و ئاستی ئاوی ڕووبارو جۆگە (٢) پێوەری ئاستی ئاوی تەنکی و بەرمیل... هتد

**water glass,** (١) پەرداخ
(٢) بۆرییەکی بن شووشەیییە بۆ سەیرکردنی شتی ژێرئاو.
(٣) پێوەری ئاوی شووشە
(٤) گیراوەی سۆدیۆم سلیکات لە ئاودا (لە سڕێش و ماددەی ئاوبڕکەردا بەکاردێت) (= water clock

**water gum,** = tupelo.

**water heater,** ئاو گەرمکەر بەرمیلی ئاو گەرم کردن بە گاز یا بە کارەبا (بۆ گەرماو و پێویستی تری ناوماڵ).

**water hemlock,** ڕووەکێکی ژەهراوی ئاوییە.

**water hen,** مریشکی ئاوی باڵندەیەکی ڕەشی قاچ تەنراوە لە مریشك دەچێ لە دەوری ئاو و ئاوئاودا دەژی؛ مریشکە ڕەشە. (هەروەها " coot ").

**water hole,** چاڵاو (بەتایبەتی کە گیاندار ئاوی لێ دەخۆنەوە)؛ گۆمی بچکۆلە

**water ice,** (١) سەهۆڵی ئاو سەهۆڵێکە لە بەستنی ئاوەوە پێکهاتووە نەك لە کەڵەکەبوونی بەفرەوە. (٢) شیرینییەکی پڕ لە بەفرە لە دۆندرمە دەچێ. (هەروەها " sherbet ").

**watering place,** (١) شوێنی ئاودانی وڵاخ و ئاژەڵ؛ شوێنی ئاوخواردنەوەی گیاندار (٢) spa (٣) مەیخانە؛ بار.

**watering pot,** ئاوپرژێن دەفرێکی لوولە کون کونە بۆ ڕووەك ئاودان. (پێشی دەوترێ " watering can ").

**waterish** (wô′tẽr-ish, wät′ẽr-ish), ***adj.*** watery.

**water jump,** بازدی ئاوی کۆسپێکی ئاوە وەك گۆم یا خەندەقی پڕ لە ئاو لە هەندێ پێشبڕکێدا ئەسپ بەسەریدا باز دەدات

**waterless** (wô′tẽr-lis, wät′ẽr-lis), ***adj.*** (١) بێ ئاو؛ ووشك
(٢) پێویستی بە ئاو نییە بۆ ساردکردنەوەی (مەکینە).

**water level,** (١) (ا) ڕووی ئاو (ب) ئاستی ئاو.
(٢) water table # 1 (٣) water line # 1-A.

**water lily,** شلێری ئاوی؛ زەمەقی ئاوی.

**water line,** (١) هێڵی ئاو (ا) ئاستی ئاوی سەر تەنیشتی کەشتی و بەلەم. (ب) چەند هێڵێکی ئاسۆیییە بە تەنیشتی کەشتییەوە پلەی نوقوم بوونی کەشتییەکە نیشان دەدات بە بارکراوی و نیمچە بارکراوی و بەتاڵییەوە.
(٢) نیشانە یا هێڵی ئاستی بەرزبوونەوەی ئاو لەسەر دیواری کەناردەریا.

**water-logged** (wô′tẽr-lôgd′, wät′ẽr-logd′), ***adj.*** (١) ئاو زۆر تێچوو و قورس و سست (کەشتی و بەلەم): *( ~ boats)*.
(٢) خووساو (زەوی)؛ تێراو؛ وەك زەلکاو لێهاتوو. *( ~ fields)*.

**Waterloo** (wô′tẽr-lōō′), ***n.*** (١) واترلوو؛ شەڕی واترلوو (کە ناپلیۆنی تێدا شکا ساڵی ١٨١٥) (٢) تێکشکان؛ دۆڕان؛ ژێرکەوتن؛ بەزین؛ شکان *(He met his W~ in the elections.)*.

**water main,** بۆری سەرەکی ئاو (بەتایبەتی هی ژێرزەمین)؛ شا بۆری ئاو.

**waterman** (wô′tẽr-mən, wät′ẽr-mən), ***n.*** (١) بەلەمەوان
(٢) سەوڵ لێدەر

**watermanship** (wô′tẽr-mən-ship′), ***n.*** ئیش و لێهاتوویی بەلەمەوانی و سەوڵ لێدان.

**watermark** (wô′tẽr-märk′, wät′ẽr-märk′), ***n.*** (١) نیشانەی ئاو: ئەو نیشانەیەیە کە ئاستی بەرزبوونەوەی ئاو پیشان دەدات.
(٢) نیشانەی ڕۆشنی سەر کاغەز.
***v.t.*** کاغەز نیشانەکردن بە نیشانە یا نەخشی ڕۆشن.

**watermelon** (wô′tẽr-mel′ən, wät′ẽr-mel′ən), ***n.*** شووتی.

**water meter,** سەعاتی ئاو (بۆ پێوانی ئاوی بەکارهێنراو).

**water mill,** ئاشی ئاو.

**water moccasin,** ماری ئاوی: جۆرە مارێکی گەورەی ژەهراوی زەلکاو و چەمەکانی لای خوارووی ئەمەریکایە

**water nymph,** پەری دەریا؛ بانوخوای ئاوی (ئەفسانەی یۆنان و رۆمان).

**water oak,** بەڕووی ئاو: جۆرە داربەڕوویەکی ئەمەریکی قەراغ ڕووبارو جۆگەکانە.

**water ouzel,** باڵندەیەکی بچووکی قەراغ ئاوە.

**water ox,** = water buffalo.

**water parting,** = watershed.

**water pipe,** (١) بۆری ئاو. (٢) نێرگەلە.

**water pistol,** دەمانچەی ئاو. (هەروەها " squirt gun ").

**water plant,** (١) ڕووەکی ئاوی؛ ڕووەکی ژێر ئاو؛ ڕووەکێکە کە یا هەمووی لە ژێر ئاودا بێت یا هەندێ لە قەدو گەڵاکانی بەسەر ئاوەوە بن
(٢) ڕووەکی تەڕووشکی.

**water plantation,** ڕووەکێکی ئاوی گەڵا پانە لە شێوەی دڵدا گوڵی سپی دەگرێ.

**water polo,** یاری تۆپی ئاو؛ تۆپێنی ئاو.

**water power,** (١) ووزەی ئاو (بۆ مەکینە گێڕان).
(٢) تاڤگە یا ڕێژاوی ووزە لێ درووستکردن.
(٣) مافی ئاو (کە ئاشی ئاو هەیبێت).

**water-proof** (wô′tẽr-prōōf′, wät′ẽr-prōōf′), ***adj.*** ئاوبڕ؛ ئاودانەدەر: *( a ~ watch)*.
***n.*** (١) قوماشی ئاودانەدەر. (٢) [Chiefly British]، مشەما؛ پاڵتۆی باران.
***v.t.*** ئاوبڕکردن.

**water-repellent,** بەرگەی ئاو دەگرێ، بەڵام ئاودانەدەری تەواو نییە.

**water-resistant,** بەرگری ئاو دەکات، بەڵام ئاوبڕی تەواو نییە.

**water right,** (١) مافی ئاو: مافی ئاو ڕاکێشان لە ڕووبارو جۆگەو دەریاچەوە. (٢) مافی کەشتیوانی.

**water sapphire,** جۆرە بەردێکی بەنرخە.

**waterscape** (wô′tẽr-skāp′, wät′ẽr-skāp′), ***n.*** = seascape.

**water scorpion,** دووپشکی ئاوی.

**watershed** (wô′tẽr-shed′, wät′ẽr-shed′), ***n.*** (١) ئاوڕێژ. (هەروەها " water parting ").
(٢) دیوێکی ئاوەڕێژ؛ ئاوچەیەکە کە ئاوەکەی دەچۆڕێتەوە ناو ڕووبارێك.
(٣) ڕووداوێکی گرنگ (لەڕووی جیاکردنەوەوە)؛ ڕادەی یەکلایی؛ هێڵی جیاکەرەوەی دوو قۆناغ یا بارودۆخ: *(The treaty to ban most atomic tests is one of history's great ~s.)*

**water shield,** نێڕی ئاوی: جۆرە ڕووەکێکی ئاوییە.

**water sick,** ئەوەندە ئاو دراوە بێ پیت بووەو هیچی تێدا ناچێنرێ.

**waterside** (wô′tẽr-sīd′, wät′ẽr-sīd′), ***n.*** قەراغ ئاو؛ کەنار دەریا و دەریاچەو ڕووبار.
***adj.*** (١) قەراغ ئاوی؛ لە قەراغ ئاودایە؛ تایبەتی بە ئاوچەی قەراغ ئاو.
(٢) (ا) لە قەراغ ئاودا دەژی
(ب) لە قەراغ ئاودا ئیش دەکات.

**water-skater,** = water strider.

**water-ski** (wô′tẽr-skē′, wät′ẽr-skē′), ***v.i.*** ئاوە خلیسکێ کردن (بە ڕاکێشران بە دوای بەلەمی خێراوە)

*n.* پێلاوی ئاوە خلیسکێ (کە بریتییە لە پارچەیەك دار یا باغەی درێژ کە بە دوای بەلەمی خێراوە دەبەسترێ و ئاوە خلیسکێی لەسەر دەکرێ).

**water snake,** ماری ئاوی: چەند جۆرە مارێکی ئاژەهراوی ئاو ڕووبارو جۆگەن

**water-soak** (wô′tẽr-sōk′, wät′ẽr-sōk′), *v.t.* خووساندن؛ نوقوم کردن لە ئاودا.

**water spaniel,** سەگێکی تووك لوول و سووربارە بۆ هێنانەوەی مەلی ئاویی ڕاوکراو باشە.

**water-spout** (wô′tẽr-spout′, wät′ẽr-spout′), *n.* (١) لوولە (لوولێنە، مەسینە، قۆری... هتد)؛ پلووسك.
(٢) گێژەلوولکەیەکە بەسەر ئاوەوە لە ڕەحەتی دەچێ.

**water sprite,** = water nymph.

**water strider,** ئاو ڕۆشکەرەوە: مێرووییەکە بەسەر ڕووی ئاودا دەسووڕێتەوە. هەروەها " skater "، " water-skater "، " skipper "، " skimmer ".

**water supply,** (١) ئازووقەی ئاو: ئەو ئاوەیە کە شارێك یا ناوچەیەك هەیەتی بۆ بەکارهێنان. (٢) سەرچاوەو عەمارو شێوەو ڕێی ئاو دابەشکردن.

**water system,** (١) ڕووبارێك بە جۆگەو زێکانی‌یەوە.
(٢) water supply.

**water table,** (١) ئەو ئاستەی زەمینە کە ژێرەکەی خووساوە. واتە هیچی تر ئاو هەڵنامژێ. (٢) لێوارێکی دەرپۆقیوە بۆ دیوار پاراستن لە باراناو

**water thrush,** ڕیشۆلەی ئاوی: باڵندەیەکی دەنگ خۆشی قەراغ ڕووبارە

**water-tight** (wô′tẽr-tīt′, wät′ẽr-tīt′), *adj.* (١) ئاوبڕ؛ ئاوی لێ ناچێ (٢) ڕوون؛ لێڵی تێدا نییە؛ تەنها یەك لێکدانەوە یا مانای هەیە.
(٣) سەرکەوتنی مسۆگەرە؛ ژێرکەوتنی بۆ نییە؛ پتەو (مەجاز): *( a ~ plan)* .

**water tower,** (١) عەمباراو؛ تانکی ئاو؛ ئاوگیر.
(٢) ئامێرێکی ئاگر کوژاندنەوەیە ئاو هەڵدەدات بۆ خانووی بەرز.

**water vapor,** هەڵمی ئاو؛ ئاوی هەڵم لێ هەڵساو (بەتایبەتی پێش کوڵان).

**water-way** (wô′tẽr-wā′, wät′ẽr-wā′), *n.* ئاوەڕێ بەتایبەتی کە بۆ کەشتیوانی بشێ. (هەروەها " water-course ").

**water-weed** (wô′tẽr-wēd′, wät′ẽr-wēd′), *n.* گیا ئاوی. ڕووەکێکی گەڵا پڕو بارێکی گوڵ بچووکە قەدەکەی لە ژێر ئاودایە.

**water wheel,** گەردوونە؛ جەنجەڕی ئاوهەڵهێنجان؛ چەرخی ئاوهەڵکێز.

**water wings,** باڵی ئاوی: ئامێرێکی لاستیکی‌یە فووی تێ دەکرێ لە شێوەی دوو باڵدایە بۆ مەلە فێربوون.

**water witch,** جادووگەری ئاو: کەسێکە گوایە ئاوی ژێرزەمین دەدۆزێتەوە بەهۆی داری ڕەمڵ لێدانەوە

**water-works** (wô′tẽr-wũrks′), *n.pl.* (١) دەزگای عەمارکردن و هەڵهێنجان و دابەشکردنی ئاو بەسەر شاردا. (هەروەها " water system ").
(٢) ئێستگەیەکی هەڵهێنجان. (٣) فوارە.
(٤) [Slang]. فرمێسك؛ گریان؛ فرمێسك ڕشتن: *( to turn on the ~ .)* .

**water-worn** (wô′tẽr-wôrn′, wät′ẽr-wôrn′), *adj.* سواوە بە ئاو؛ ساف و لووس بووە بە ئاو پێدا ڕۆیشتن.

**watery** (wô′tẽr-i, wät′ẽr-i), *adj.* (١) ئاوی؛ شلاوی؛ شلەیی؛ لە ئاو دەچێ (٢) تەڕ؛ خووساو: *( ~ soil)*
(٣) ڕوون *( ~ soup, tea, coffee, etc.)* .
(٤) بێ هێز؛ خراپ؛ لاواز: *( ~ prose)* .
(٥) باراناوی (هەور).
(٦) فرمێسکاوی؛ گریاو: *( ~ eyes)* .
(٧) ئاودز کردوو (برین، تلۆق)

**-wateriness** *(n.)*.

**watt** (wät, wôt), *n.* وات یەکەی هێزی کارەبا؛ پێوانەی ووزەی کارەبا

**wattage** (wät, wôt), *n.* (١) هێزی کارەبای بە " وات " پێوراو
(٢) سەرجەمی " وات " یا هێزی کارەبای پێویست بۆ ئیش پێکردنی مەکینەیەك.

**watt-hour** (wät′our′, wôt′our′), *n.* واتی یەك ساتی یەکەی هێزی کارەبای یەك واتی بۆ ماوەی یەك سات.

**wattle** (wät′'l, wôt′'l), *n.* (١) تەیمان؛ چەپەر
(٢) تووڵی تەیمان و چەپەر؛ قیسپ. (٣) *(pl.)*، خێزەرە.
(٤) چەند جۆرە درەختێکی ئوستورالی‌یە چڵەکانی بۆ تووڵی تەیمان بەکاردێت.
(٥) چەرمی شۆڕبووەوەی بەرملی قەلەموون و کەڵەشێر؛ غەبغەبە.
(٦) barbel # 1

*adj.* بە تووڵ چنراو.

*v.t.* (١) چنین (تەیمان). (٢) بە تووڵ درووستکردن یا چنین.
(٣) بە خێزەرە درووستکردن (سەربان).

**wattle-bird** (wät′'l-bũrd′, wôt′'l-bũrd′), *n.* باڵندەیەکی ئوستورالی‌یە چەرم لە گوێکانی‌یەوە شۆڕبووەتەوە بە " هەنگوێن خۆر " پێش ناسراوە.

**wattled** (wät′'ld, wôt′'ld), *adj.* (١) بە تووڵ چنراو (وەك تەیمان یا چەپەر). (٢) چەرمێکی گرنج گرنجە لە بەرملیەوە شۆڕبووەتەوە (وەك قەلەموون).

**wattmeter** (wät′mē′tẽr, wôt′mē′tẽr), *n.* وات پێوەر (کارەبا).

**wave** (wāv), *v.i.* (١) شەکانەوە. *( The flag ~s.)* .
(٢) ڕاوەشان (دەست): *( He ~d to us.)* .
(٣) لوول بوون (قژ)؛ لە شەپۆل چوون: *( Her hair ~s naturally.)* .

*v.t.* (١) شەکاندنەوە: *( He ~d the flag.)* .
(٢) ڕاوەشاندن (چەك). *( He ~d his pistol at them.)* .
(٣) دەست ڕاوەشاندن؛ نیشانە بۆ کردن بە دەست: *( We ~d farwell.)*
(٤) لوول کردن: *( She ~s her hair.)* .
(٥) شێوەی شەپۆل ئاسایی پێدان.

*n.* (١) شەپۆل. (٢) [Poetic]، ئاو؛ دەریا.
(٣) (ا) کەروێشکەکردنی دەغڵ‌ودان و گیا لە باهەڵکردندا. (ب) لوولی قژ
(ج) وەك شەپۆل نوواندنی ئاوریشم... هتد.
(٤) دەست ڕاوەشان
(٥) (ا) بەرزبوونەوە؛ زۆربوون؛ ئاوسان: *( a crime ~ ; a heat ~ )* .
(ب) ژمارەیەکی زۆر؛ لێشاو: *( a ~ of immigration)* .
(٦) شەپۆل (تەزووی کارەبا)؛ بەرزونزمی تەووژمی کارەبا؛ تەووژم.
(٧) شەپۆل (ڕووناکی، دەنگ، گەرمی) .

**wave-band** (wāv′band′), *n.* مەودای شەپۆل (ڕادیۆ)

**wave-length** (wāv′length), *n.* (١) درێژی شەپۆل (فیزیا)
(٢) [Colloq.]، هاوبیرو هاوسۆز؛ جۆری بیروباوەڕو هەست:
*( We are both on the same ~ .)*

**waveless** (wāv′lis), *adj.* بێ شەپۆل؛ کپ؛ مەنگ

**wavelet** (wāv′lit), *n.* شەپۆلی بچکۆلە.

**waver** (wā′vẽr), *v.i.* (١) شنەکردن؛ شەکانەوە:
*( Foliage ~s in the breeze.)*
(٢) تروووسکانەوە؛ پرتەپرت کردن؛ تروووسکە هاتن.
(٣) شلۆق بوون؛ نووچدان؛ بێ هێزبوون؛ شلەژان؛ شێوان.
(٤) لەرزین (دەست، دەنگ): *( Her voice ~ed.)* .
(٥) دوودڵی کردن؛ ڕاڕایی کردن؛ دوودڵ بوون:
*( He ~ed in his determination.)*
(٦) گۆڕان؛ هەمیشە گۆڕان یا بەرزونزم بوونەوە: *( Prices ~ed.)*
(٧) لارەولارکردن؛ لەتردان؛ بەم لاو بەولادا کەوتن.

*n.* شنە؛ لارەولار؛ لەرزین؛ لەرە؛ لەتر؛ دوودڵی؛ ڕاڕایی.

**wavy** (wāv′i), *adj.* (١) شەپۆلاوی *( a ~ sea)* .
(٢) شەپۆلی؛ پێچاوپێچ؛ بە تەکان ڕۆیشتوو؛ وەك شەپۆل بزواو
(٣) لوول؛ شەپۆلی: *( ~ hair)*
(٤) شەپۆلی؛ لە شەپۆل دەچێ؛ تایبەتی بە شەپۆل.
(٥) شلۆق؛ نەچەسپیو؛ لەرزۆك؛ لارەولارکەر.

**-wavily** *(adv.)*; **waviness** *(n.)*.

**wax** (waks), *n.* (١) مێو؛ مۆم (٢) (ا) مێوی گوێ
(ب) هەر ماددەیەکی لە مێو چووە کە ڕووەك و گیاندار دەری بدەن

(ج) مێوی لوك كردن.
**v.t.** مێوكردن؛ مێو تێهەڵسوون؛ بریقە لێ هەڵساندن؛ تیف تیفە دان.
**adj.** مێوی. مۆمی: لە مێو یا مۆم دروستكراو.
**wax** (waks), *n.* [Chiefly British Colloq.]. توورەیی؛ هەڵچوون؛ توورەبوون.
**wax bean,** لۆبیای مێوی. جۆرێكە لە لۆبیا
**wax-berry** (waks'ber'i), *n.* ڕووەكی تووە سپیكە؛ بەری ئەم ڕووەكە؛ تووە بەفرینە
**wax-bill** (waks'bil'), *n.* دەنووك مێوی. باڵندەیەكی دەنووك سوور، پەمەیی. یا مۆمییە بە زۆری لە قەفەزدایە.
**waxen** (wak's'n), *adj.* (١) مۆمی؛ لە مۆم دروستكراو.
(٢) مۆمی؛ لە مۆم دەچێ؛ نەرمو شلو سپیو بریقەدار.
(٣) بە مۆم داپۆشراو
**waxen** (wak's'n), *past participle of* **wax**.
**wax insect,** مێرووی مێوی. چەند جۆرە مێروویەكن ماددەیەكی مۆمی دەردەن
**wax myrtle,** دەوەنێكە بەرێك دەگرێ بە مێو داپۆشراوە مۆمی لێ دروست دەكرێ
**wax palm,** داری مێو. دارێكی دارخورماییە مێوی لێ دەردێتو دەكرێ بە مۆم.
**wax paper,** *Also* waxed paper, كاغەزی مێوی
**wax-wing** (waks'wiŋ'), *n.* باڵ مێوی. باڵندەیەكی سەر پۆپنەدارە سەری باڵی سوورە لە مێوی سوور دەچێ.
**wax-work** (waks'wûrk'), *n.* (١) پەیكەری مێوین (بەتایبەتی هی مرۆڤ). (٢) (*pl.*). پیشانگای پەیكەری مێوین؛ پیشاندانی پەیكەری مێوین لە مۆزەخانەدا
**-wax-worker** *(n.).*
**waxy** (wak'si), *adj.* (١) مێوی. مۆمی؛ بە مۆم داپۆشراو؛ لە مۆم پێكهاتوو. (٢) مێوی. (ا) زەرد؛ سپی. (ب) نەرموشل؛ بریقەدار.
**way** (wā), *n.* (١) ڕێ؛ ڕێگە؛ ڕێگا. ***( The ~ was rough.)***
(٢) بوار؛ ڕێ. (٣) ڕۆیشتن بە ڕێیەكی تایبەتیدا.
(٤) ڕێباز؛ ڕێڕەو؛ شێوەی ڕەووشتو ژیان: ***( to fall into evil ~s )*** .
(٥) (ا) شێوە؛ شێوەی كاركردن؛ جۆر؛ ڕەنگ: ***( Do it this ~. )*** .
(ب) بار ***( Put it in this ~ )*** .
(٦) شێوەی ئاسایی ڕەفتاری خەڵكو جیهان: ***( the ~ of the world)*** .
(٧) شێوازی تایبەتی ڕەووشتو كردار؛ ڕێگە:
***( That's just his ~.; You must learn their ~s .)***
(٨) شێواز؛ ڕەووشت، هەڵسانو دانیشتن: ***( He had a pleasant ~ .)*** .
(٩) بەرێوەبوون (مەجان؛ بزوان؛ لەگەڕدا بوون: ***( under ~ )*** .
(هەروەها " weigh ") .
(١٠) ماوە؛ دووری: ***( a long ~ off )*** .
(هەروەها " ways ") .
(١١) لا؛ ڕێ: ***( Go this ~. Look this ~ )*** .
(١٢) ڕوو؛ لا: ***( In some ~s you are right.)*** .
(١٣) خواست؛ حەز: ***( to have one's ~ )*** .
(١٤) مەودا (شارەزایی): ***( That never came my ~ .)*** .
(١٥) [Colloq.]. دۆخ؛ بارودۆخ:
***( He is in a bad ~.; The business is in a fair ~.)***
(١٦) [Colloq.]. پیشە
(١٧) سەرە (بلیتی هاتوچۆ: ***( a one- ~ ticket)***
(١٨) [Colloq.]. ناوچە؛ گوزەر: ***( out our ~ )***
(١٩) مافی پێدا ڕۆیشتن یا تێپەڕبوون: ***( to have right of ~ )*** .
(٢٠) چوارچێوەی كەشتی لەسەر دروستكردنو لێوە خستنە ئاوەوە.
**adv.** [Colloq.]. دوور؛ ماوەیەكی زۆر
***( He is ~ behind. She is ~ ahead.)***

**by the way,** (١) ئەری؛ بۆ تێبینیو شت بیرخستنەوەو پرسیار... هتد.
(٢) لە ڕێگەدا؛ لە كاتی گەشتەكەدا.
**by way of,** (١) لە ڕێی؛ لە؛ لە ڕێگەی:
***( I came to New York by way of London.)***
(٢) لەڕووی؛ وەك؛ بەو ناوەوە:
***( He made no comment by way of apology.)***
(٣) بۆ؛ بۆ مەبەستی:
***( to number articles by way of distinguishing them.)***
(٤) [Chiefly British]، لە بارێك یا پلەیەكدا بوون.
**come one's way,** (١) هاتنە دەست؛ دەسكەوتن.
(٢) [Slang]، سەركەوتن؛ بە دڵی خۆ بوون؛ بۆ هاتن.
**give way,** (١) كشانەوە؛ دان بە دەستەوە؛ بەرهەڵستی نەكردن؛ چۆڵ كردن:
***( The army gave way before the advance of the enemy.)***
(٢) پسان؛ تلیسانەوە؛ ڕووخان؛ بەرگە نەگرتن.
**give way to,** بەر بۆ بەرەڵاكردن؛ قایل بوون؛ ڕێگە لێ نەگرتن:
***( He gave way to their entreaties.)***
**go out of the ( or one's ) way,** هەوڵێكی زیادەو تایبەتی دان (بۆ جێبەجێكردنی كارێك): ***( He went out of his way to help us.)***
**have a way with,** دەزانێ چۆن لەگەڵیاندا هەڵدەستێو دادەنیشێ:
***( He has a way with women, horses, etc.)***
**have one's way,** چی بوێت دەیكات؛ بە هەوەسی خۆ جووڵانەوە.
**in the way,** كۆسپ؛ بووە بە كۆسپ؛ ڕێی گرتووە.
**look the other way,** چاو لێ پۆشین؛ چاو لێ نووقاندن.
**lose one's way,** ڕێ وونكردن؛ وون بوون؛ ڕێ لێ تێكچوون؛ گومرابوون.
**make one's way,** (١) بەرەو پێشەوە ڕۆیشتن؛ تەكاندان بۆ پێشەوە؛ چوون. (٢) بە هەوڵوكۆششی خۆ سەركەوتن یا پێشكەوتن؛ ڕێ بۆ خۆ كردنەوە.
**make way,** ڕێ بۆ كردنەوە؛ دردان؛ جێ بۆ چۆڵ كردن؛ جێ كردنەوە.
**one way or another,** هەرچۆنێك بێ؛ بە هەر ڕێگەیەك بێت:
***( One way or another we will be free.)***
**out of the way,** (١) لە ڕێدا نییە؛ كۆسپ نییە؛ ڕێی نەگرتووە.
(٢) لابراوە. (٣) سەری كراوە بە گۆمدا؛ كوژراوە.
(٤) لەسەر ڕێدا نییە؛ دوورە لە ڕێگەی ئاساییەوە.
(٥) (ا) نابەجێ. (ب) نائاسایی.
**pave the way for,** ڕێ بۆ كردنەوە؛ ڕێ بۆ خۆش كردن؛ ڕێ بۆ ئامادەكردن.
**take ( or go ) one's way,** ڕۆیشتن؛ چوون.
**under way,** لە پێشكەوتندایە؛ بەرەو پێشەوە دەڕوات؛ لە كردندایە (كار)؛ خەریكە دەكرێت.
**waybill** (wā'bil'), *n.* بارنامە: لیستەیەكە ناوی شتومەكی بارگەكەو كرێی گواستنەوەو شێوەی گواستنەوەی تێدایە.
**wayfarer** (wā'fâr'ēr), *n.* ڕێبوار (بەتایبەتی بە پێ)؛ ڕێبواری پیادە.
**wayfaring** (wā'fâr'iŋ), *n.* ڕێبواری پیادە؛ بە پێ ڕێ بڕین.
**adj.** بە پێ ڕۆیشتوو؛ پیادە: ***( a ~ man )*** .
**waylaid** (wā'lād'), *past tense and p.p of* **waylay.**
**waylay** (wā'lā'), *v.t.* (١) داو بۆ نانەوە؛ بۆسە بۆ نانەوەو هێرش بردنە سەر؛ خۆ بۆ نانەوە؛ خۆ مەڵاسدانو پەلاماردان.
(٢) چاوەڕێ كردنو لەپڕ بانگ كردن یا قسە لەگەڵ كردن.
**ways** (wāz), ***n.pl.*** [Colloq.], دووری: ***( a long ~ off )*** .
**-ways** (wāz), پاشگرێكە بەمانای: بار (لەم بارە، لەو بارە... هتد)؛ شێوە؛ جۆر؛ ڕێیەكی تایبەتی: ***( sideways)*** .
(هەروەها " wise- ") .
**ways and means,** (١) هۆو ڕێی بە ئەنجام هێنانی كارێك.
(٢) [W- & M-]، (ا) هۆو ڕێی پارە كۆكردنەوە بۆ میری بۆ خەرج كردنی

لەسەر وولات. (ب) لیژنەیەکی پەرلەمانییە بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە.
**wayside** (wā'sīd´), *n.* قەراغ ڕێ
*adj.* هی قەراغ ڕێ؛ لە نزیك ڕێگەدایە: *( a ~ motel, inn, shop, etc.)* .
**way station,** کوێرە ئێستگە: ئێستگەیەکی شەمەندەفەری بچووکە لەنێوان دوو ئێستگەی سەرەکیدا کە شەمەندەفەر تەنها بە داواکردن لێی دەوەستێ
**way train,** شەمەندەفەرێکە کە لە هەموو ئێستگەکان دەوەستێ؛ شەمەندەفەری ناوخۆ.
**wayward** (wā'wērd), *adj.* (١) لاسار؛ سەرکێش؛ سەرچڵ؛ گومڕا: *( a ~ son)*
(٢) حولحول؛ بێ بار؛ هەمیشە گۆڕاو.
(٣) [Archaic]. دژوار؛ ناهەموار؛ نالەبار: *( his ~ fate)* .
-waywardly *(adv.)*; waywardness *(n.)*.
**way-worn** (wā'wôrn´, wā'wōrn´), *adj.* ماندووی ڕێگە؛ هیلاکی ڕێ
**w.c.,** = water closet.
**we** (wē; *unstressed* wi), *pron.* ئێمە.
**weak** (wēk), *adj.* (١) لاواز (لەش)؛ بێ هێز؛ زەبوون.
(٢) لاواز (پێشبڕکێ، جەنگ): *( a ~ team)* .
(٣) بێ وورە؛ زەبوون؛ لاواز (ڕەووشت).
(٤) بێ مێشك؛ مێشك سووك؛ ناتەواو.
(٥) بێ دەسەلات؛ بێکارە؛ بوودەڵە؛ دەستەپاچە: *( a ~ monarch)* .
(٦) ناپتەو؛ ناقایم؛ ناسك: *( a ~ rail)* .
(٧) بەرگەنەگر؛ شلۆق؛ لاواز: *( ~ fortification)* .
(٨) سیسەڵە؛ بێ تین؛ بێ ووزە؛ پەککەوتە.
(٩) کز؛ بێ هێز؛ ناتەواو: *( ~ eyes, ears, etc.)* .
(١٠) هێواش؛ بێ هێز؛ بێ تین؛ کز: *( a ~ voice, current, etc.)* .
(١١) ڕوون: *( ~ tea)* .
(١٢) کۆڵ؛ نەزان *( ~ in mathematics)* .
(١٣) نابەجێ؛ بێ بەڵگە؛ کەسی پێ ناسەلمێنرێ: *( a ~ argument; ~ logic)*
(١٤) ئەندازەیی (کردار- ڕێزمان)؛ دەستووری: کردارێکە کە " ed " یا " d " دەخرێتە سەر بۆ سەردەمی ڕابوردوو: *( a ~ verb)* .
(١٥) هێزی ناخرێتە سەر (بڕگە)؛ نەگیراو (دەنگناسی).
**weaken** (wē'kən), *v.t.* بێ هێز کردن؛ لاوازکردن.
*v.i.* بێ هێز بوون؛ لاوازبوون؛ تین تێدا نەمان.
**weakfish** (wēk'fish´), *n.* چەند جۆرە ماسییەکی دەریایین.
**weak-hearted** (wēk'här´tid), *adj.* ترسنۆك.
**weakish** (wēk'ish), *adj.* (١) نەختێك بێ هێز؛ تۆزێك لاواز.
(٢) نەختێك ڕوون: *( ~ tea)* .
**weak-kneed** (wēk'nēd´), *adj.* ڕاڕا؛ دوودڵ؛ بێ وورە؛ ترسنۆك.
**weakling** (wēk'liŋ), *n.* (١) کەسێکی لاواز یا بێ هێز؛ کەسێك یا گیاندارێکی جیقن و بێ توانا. (٢) کەسێکی بوودەڵە؛ کەسێکی بێ دەسەلات یا دەستەپاچە؛ گەندەپیاو.
*adj.* بوودەڵە؛ بێ دەسەلات؛ دەستەپاچە؛ گەندەپیاو.
**weakly** (wēk'li), *adj.* لاواز؛ سیسەڵە؛ سیس؛ بێ هێز؛ ناسك؛ جیقن.
*adv.* (١) بە لاوازانە؛ بێ هێزانە. (٢) بە بوودەڵەیی؛ بێ دەسەلاتانە.
-weakliness *(n.)*.
**weak-minded** (wēk'mīn´did), *adj.* (١) ڕاڕا؛ دوودڵ
(٢) بێ مێشك؛ مێشك سووك یا ناتەواو.
**weakness** (wēk'nis), *n.* (١) لاوازی؛ بێ هێزی؛ بێ تینی؛ کزێتی؛ زەبوونی (٢) کەموکووڕی (ڕەووشت)؛ ناتەواوی
(٣) ( ~ for )، حەزێکی زۆر: *( He has a ~ for women.)* .
(٤) شتێکی زۆر حەزلێکراو: *( Candy is a ~ of hers.)* .
**weal** (wēl), *n.* جێ نیشانی لێدان بە لەشەوە؛ شوێن قامچی.
**weal** (wēl), *n.* (١) [Archaic] ، خێروخۆشی؛ خۆش گوزەرانی؛ بەختەوەری؛ بەختیاری؛ چاکە؛ بەرژەوەندی؛ خۆشی: *( the public ~ ; ~ and woe)*
(٢) [Obs.]، سامان.
(٣) [Obs.]، میری؛ دەوڵەت؛ فەرمانڕەوایی.
**weald** (wēld), *n.* (١) دارستان.
(٢) دەشتودەری بەرز؛ هەرێمی بەرزی بەر بەرەڵا.
**wealth** (welth), *n.* (١) سامان؛ دارایی؛ ماڵ.
(٢) زەنگینی؛ دەوڵەمەندی؛ سامانداری.
(٣) زۆری؛ فرەیی: *( a ~ of ideas)* .
(٤) شتی نرخدار؛ فرۆتەنی؛ هەرشتێك نرخی هەبێت و بکڕدرێت و بفرۆشرێ.
**wealthy** (wel'thi), *adj.* (١) زەنگین؛ دەوڵەمەند؛ سامان‌دار؛ پارەدار.
(٢) زۆری هەیە یا تێدایە؛ دەوڵەمەند: *( a language ~ in idioms)*
-wealthily *(adv.)*; wealthiness *(n.)*.
**wean** (wēn), *v.t.* (١) لە مەمك بڕینەوە؛ لە شیر بڕینەوە: *( to ~ a baby from the breast)*
(٢) لێ بڕینەوە (لە خوو و ڕەووشت یا هاوڕێی خراپ... هتد)؛ لێ بڕین؛ لێ دوورخستنەوە: *| How can we ~ him (away) from his bad companions?|*
**weanling** (wēn'liŋ), *n.* منداڵی تازە لە مەمك بڕاوە؛ بێچووی تازە لە شیر بڕاوە.
*adj.* تازە لە مەمك یا شیر بڕاوە.
**weapon** (wep'ən), *n.* (١) چەك؛ تیغ.
(٢) ئەندامێکی گیاندار کە وەك چەك بەکاری بهێنێ (وەك شاخ، چنگ... هتد).
(٣) هۆی هێرش بردن و خۆپاراستن؛ چەك: *( His best ~ was silence. Her smile was his most effective ~ .)*
*v.t.* چەکدارکردن؛ چەك پێدان.
**weaponry** (wep'ən-ri), *n.* (١) چەك دروستکردن.
(٢) چەك بەگشتی (بەتایبەتی چەکی جەنگی وولاتێك).
**wear** (wâr), *v.t.* (١) لەبەرکردن؛ پۆشین؛ لەپێکردن؛ لەسەرکردن؛ لەچاوکردن.
(٢) نوواندن؛ پیشاندان؛ پێوەبوون: *( She wore a smile.)* .
(٣) لەخۆدان (ئارایشت، فیشەك لەغ، نیشانەی تایبەتی): *( She ~s make-up.)*
(٤) هەبوون؛ هەڵگرتن: *( He ~s a famous name.)* .
(٥) ڕاگرتن: *( He wore his head high.)* .
(٦) ئاڵا هەڵکردن (کەشتی).
(٧) ( ~ away )، سواندن: *( The feet of thousands of people had worn away the steps.)*
(٨) بەکارهێنان تا ڕادەیەکی تایبەتی: *( He wore his coat to rags.)* .
(٩) تێکردن (کون)؛ والێکردن: *( It will ~ a hole in the floor.)* .
(١٠) ماندووکردن؛ هیلاك کردن.
(١١) ( ~ away; ~ out )، کات بردنەسەر بە هێواشی.
*v.i.* (١) سوان؛ چوونەوە (ڕەنگ)؛ دڕان؛ پوان: *( That cloth will ~ soon.)*
(٢) بەرگەگرتن: *( That suit ~s well.)* .
(٣) والێهاتن پاش ماوەیەك؛ کەم بوونەوە؛ کزبوون: *( My patience wore thin.)*
(٤) تێپەڕبوون بە هێواشی (کات)؛ بەسەرچوون: *( The year wore on.)* .
(٥) [Obs.]، مۆدەبوون.
*n.* (١) لەبەرکردن؛ لەپێکردن؛ لەبەرکران.
(٢) جل‌وبەرگ؛ بەرگ؛ جل: *( men's ~ )* .
(٣) مۆدە.
(٤) (أ) سوان؛ چوونەوە (ڕەنگ)؛ تەنك بوون؛ دڕان.
(ب) ڕادەی ئەم سوانە یا چوونەوەیە.

(٥) بەرگەگرتن (بەکارهێنان، لەبەرکردن... هتد):
*( There isn't much ~ left in my coat.)*
**-wearer** *(n.).*
**wear down,** (١) سواندن؛ تەنك بوون؛ سوان:
*( The heels of these shoes are worn down.)*
(٢) ماندووکردن: ماندووبوون؛ هیلاك کردن.
(٣) بۆرپێدان بە هێرشی پەیتاپەیتا؛ شکاندن (وورە)؛ بێزارکردن؛ تین لێ برین:
*( to wear down the enemy's resistence)*
**wear off,** (١) کەم بوونەوە؛ کزبوون؛ بەرەبەرە نەمان:
*( The headache wore off.)*
(٢) چوونەوە (ڕەنگ، بریقە... هتد)؛ لاچوون؛ کووژانەوە؛ لێبوونەوە:
*( The gilt soon wore off.)*
**wear out,** (١) سواندن؛ دڕاندن؛ لە کەلك خستن (بە زۆر لەبەرکردن یا بەکارهێنان)؛ لە کەلك کەوتن؛ تەنك بوون؛ پوان
(٢) بەکارهێنان و هیچ لێ نەهێشتنەوە:
*( She is wearing out her welcome.)*
(٣) ماندووکردن؛ ماندووبوون؛ هیلاك بوون؛ پڕووکان؛ پەککەوتن.
**wear** (wâr), *v.t.* وەرگێڕانی لووتی کەشتی بۆ دوورخستنەوەی لە لای با هەڵکردنەوە
*v.i.* وەرگەڕانی لووتی کەشتی بۆ دوورکەوتنەوەی لە لای با هەڵکردنەوە.
**wearable** (wâr'ə-b'l), *adj.* بۆ لەبەرکردن دەشێ؛ لەبەردەکرێ.
*n.pl.* جل‌وبەرگ؛ پۆشەنی.
**wear and tear,** سوان؛ سوان و دڕان بەهۆی بەکارهێنانەوە؛ لە نرخ کەم بوونەوە و لە کەلك کەوتنی شت بە بەکارهێنانی.
**weariful** (wêr'i-fəl), *adj.* ماندووکەر؛ بێزارکەر.
**-wearifully** *(adv.)*; **wearifulness** *(n.).*
**weariless** (wêr'i-lis), *adj.* ماندوو نابێ؛ بەکێش؛ کۆڵ نەدەر.
**-wearilessly** *(adv.).*
**wearily** (wêr'ə-li), *adv.* بە ماندوویی‌یەوە؛ بە بێزاریی‌یەوە؛ بە بێ تاقەتی.
**weariness** (wêr'i-nis), *n.* (١) ماندوویی؛ هیلاکی؛ هێز لێ بڕان.
(٢) شتێکی ماندووکەر؛ شتێکی هێز لێ بڕ.
**wearing** (wâr'iŋ), *adj.* (١) هی لەبەرکردن؛ بۆ لەبەرکردنە:
*( ~ apparel)*
(٢) دەبێتە هۆی دڕان و سوان و ڕەنگ چوونەوە و تەنك بوون.
(٣) ماندووکەر؛ ناخۆش؛ گران؛ بێزارکەر: *( a ~ experience)* .
**wearing apparel,** جل‌وبەرگ؛ پۆشەنی.
**wearisome** (wêr'i-səm), *adj.* (١) ماندووکەر؛ هیلاککەر:
*( a ~ march)*
(٢) بێزارکەر؛ وەڕسکەر؛ بێ تاقەتکەر: *( a ~ person, book, etc.)* .
**-wearisomely** *(adv.)*; **wearisomeness** *(n.).*
**weary** (wêr'i), *adj.* (١) ماندوو؛ هیلاك.
(٢) ( ~ of )، بێزار؛ وەڕس؛ لێ بێزاربوو: *( People are ~ of war.)* .
(٣) ماندووکەر؛ قورس؛ گران: *( ~ work)*
(٤) ناخۆش؛ ووشك؛ بێزارکەر
*v.i.* (١) ماندووبوون؛ هیلاك بوون. (٢) بێزاربوون؛ وەڕس بوون؛ تاقەت لێ چوون.
*v.t.* (١) ماندووکردن. (٢) بێزارکردن؛ وەڕس کردن.
**weasand** (wē'z'nd), *n.* [Archaic], (١) بۆری هەوا؛ قوڕقوڕاگە.
(٢) قوڕگ
**weasel** (wē'z'l), *n.* (١) مشکی خورما؛ ڕاسۆ؛ گیاندارێکی گۆشتخۆری درێژکۆلەی قاچ کورتی کلك تووکن و درێژە لە کۆمەڵەی دەلەك.
(٢) کەسێکی فێڵباز یا تەڵەکەباز؛ کەسێکی دووزبان.
(٣) [Slang]، سیخوڕ؛ سووسە.
*v.t.* (١) ( ~ out )، خۆکشانەوە (لە بەڵێنێك بەتایبەتی بە نالەبارانە)؛ خۆدزینەوە؛ خۆ پەراندنەوە؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە:
*( That's one invitation I would like to ~ out of. We made an open agreement and you cannot ~ out of it.)*
(٢) وەڵام نەدان بە دەستەوە؛ دووزبانی کردن؛ وەڵامی بە پێچ‌وپەنا دان نەك هی ڕاستەوخۆ. (٣) [Slang]، خەبەرلێدان؛ سیخوڕی کردن بەسەرەوە
**weasel words,** ووتەی بە پێچ‌وپەنا (بۆ خەڵەتاندن یا بەهەڵەبردن)؛ دووزبانی؛ قسەی لێڵ.
**weather** (weth'ēr), *n.* (١) ئاووهەوا (بەتایبەتی هی ڕۆژانە یا ماوەیەکی کورت)؛ کەش. (٢) (ا) ئاووهەوای ناخۆش و زیانبەخش
*( for protection against ~ )*
(ب) باوبۆرانێکی بەهێزی سەر دەریا.
*v.t.* (١) لەبەر با یا هەتاو هەڵخستن؛ بەبادان؛ ووشك کردنەوە.
(٢) ڕەنگ چوونەوە و تێکچوون و خراپ بوون بە ئاووهەوای دەرەوە.
*( a ~ed fence, table, etc.)*
(٣) ڕزگاربوون (لە ناخۆشی‌یەك یا کارەساتێك)؛ بە سەلامەتی بە بەسەرهاتێکی ناخۆشدا تێپەڕین؛ مان؛ نەفەوتان؛ لەناوچوون: *( We ~ed the storm.)* .
(٤) لێژکردنی سەربان بۆ باران تێدا نەوەستان.
(٥) بەرەو ڕووی با لێخوڕین (کەشتی).
*v.i.* (١) ڕەنگ چوونەوە و تێکچوون و خراپ بوون بە ئاووهەوای دەرەوە:
*( The wooden fence has ~ed.)*
(٢) بەرگەگرتنی ئەم ئاووهەوایەی دەرەوە: *( This canvas will ~ well.)* .
*adj.* بەرەو ڕووی با (لایەکی کەشتی).
**keep one's weather eye on,** [Colloq.], ووریابوون؛ ئاگاداربوون؛ ئاگا لە خۆ بوون
**under the weather,** [Colloq.], (١) نەختێك نەخۆش؛ نەخۆش؛ ناساغ. (٢) نەختێك سەرخۆش؛ سەرمەست؛ مەست.
**weather through,** بە سەلامەتی بە بەسەرهاتێکی ناخۆشدا تێپەڕین؛ ڕزگاربوون (لە ناخۆشی‌یەك)؛ مان؛ نەفەوتان.
**weatherability** (weth'ēr-ə-bil'ə-ti), *n.* بەرگەگرتنی ئاووهەوای دەرەوە: *( ~ of a paint)* .
**weather ballon,** باڵۆنی ئاووهەوا: باڵۆنێکە ئامێری زانیاری کۆکردنەوە دەربارەی ئاووهەوا هەڵدەگرێت.
**weather-beaten** (weth'ēr-bē't'n), *adj.* (١) ڕەنگەکەی چووەتەوە و تێکچووە و کۆن بووە بە با و باران و هەتاو... هتد.
(٢) ڕەش هەڵگەڕاو (بە هەتاو)؛ ڕەنگ چووەوە: *( a ~ face)* .
**weatherboard** (weth'ēr-bôrd', weth'ēr-bord'), *n.* (١)- **clapboard** (٢) دیوی بەرەو بای کەشتی.
**weatherboarding** (weth'ēr-bôr'diŋ, weth'ēr-bōr'diŋ), *n.* = **clapboards.**
**weather-bound** (weth'ēr-bound'), *adj.* ڕێ لێ گیراو بەهۆی باوبۆران یا بەفرەوە... هتد؛ قەتیسی با و باران یا بەفر... هتد.
**weathercock** (weth'ēr-kok'), *n.* (١) بانما؛ کەڵەشێری با: پەڕەیەکی تەنەکە یا ئاسنە لە شێوەی کەڵەشێردا لەسەر نووکی شیشێك دانراوە بۆ پیشاندانی ڕێڕەوی با. (٢) کەسێك یا شتێکی بێ بار؛ کەسێك یا شتێکی هەمیشە گۆڕاو؛ دووڕوو؛ کوڕی ڕۆژ.
**weathered** (weth'ērd), *adj.* (١) ڕەنگەکەی تێکچووە و کۆن و خراپ بووە بە ئاووهەوای دەرەوە: *( a ~ fence)* .
(٢) بە لێژی کراوە بۆ ئەوەی باراناوی لێوە بێتە خوارەوە (خانووسازی)
**weather eye,** چاوی کەسێکە کە پێشبینی ئاووهەوا گۆڕین بکات.
**weather-glass** (weth'ēr-glas', weth'ēr-gläs'), *n.* = **barometer.**
**weathering** (weth'ēr-iŋ), *n.* ووردو خاش بوونی بەرد بەهۆی گۆڕانی پلەی گەرمی و زوقم و با و بارانەوە؛ کارتێکردنی ئاووهەوا گۆڕین بۆ سەر ڕووی زەوی
**weatherman** (weth'ēr-man'), *n.* ئاووهەواناس؛ کەشزان؛ ڕاپۆرتدەری ئاووهەوا لەسەر تەلەفزیۆن و ڕادیۆ

**weather map,** نەخشەی ئاووهەوا: نەخشەیەکە گۆڕینی ئاووهەوای ناوچەیەک دەردەخات لە ماوەیەکی دیاریکراودا.
**weatherproof** (we*th*'ẽr-proof'), *adj.* بەرگەی ئاووهەوا گۆڕین دەگرێت
*v.t.* وەها لێکردن کە بەرگەی ئاووهەوا گۆڕین بگرێت؛ پاراستن لە کەش گۆڕان.
**weather ship,** کەشتی کەش: کەشتییەکە زانیاری کۆدەکاتەوە دەربارەی ئاووهەوا گۆڕین.
**weather station,** مەڵبەندی ئاووهەواناسی؛ ئیستگەی کەشزانی.
**weather-strip** (we*th*'ẽr-strip'), *n.* تیلماسکە لاستیک یا کانزایەکە درزی نێوان دەرگاو پەنجەرەو چوارچێوەکانیانی پێ دەگیرێ بۆ هەوابڕو بارانبڕکردنی.
**weather-strip** (we*th*'ẽr-strip'), *v.t.* تیلماسکە لاستیک و کانزا لێدان (ووشەی پێشوو ببینە).
**weather stripping,** (١) weather strip . (٢) weather strips
**weather vane,** = weathercock = vane # 1 .
**weatherwise** (we*th*'ẽr-wīz'), *adj.* (١) بە بەهرەیە لە پێشبینی ئاووهەوا گۆڕیندا. (٢) بە بەهرەیە لە پێشبینی هەست و بیروڕا گۆڕیندا.
**weather-worn** (we*th*'ẽr-wôrn', we*th*'ẽr-wōrn'), *adj.* = weather-beaten.
**weave** (wēv), *v.t.* (١) چنین (قوماش)؛ تەون کردن؛ تەنین.
(٢) چنین (بەرچنە، سەبەتە، زەمبیلە): *( to ~ a basket)* .
(٣) هۆنینەوە (چیرۆک، هەڵبەست)؛ هەڵبەستن:
*( He wove the incidents into a story.)*
(٤) تێهەڵکێش کردن؛ تێهەڵکێشان.
(٥) تەنین (هێلانەی جاڵجاڵۆکە): *( The spider wove its web.)* .
(٦) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ پێ بۆ خۆ کردنەوە؛ خۆ پیاکردن؛ بە مارپێچی ڕۆیشتن: *( He wove his way through the traffic.)* .
*v.i.* (١) جۆلایی کردن؛ چنین؛ تەون کردن؛ تەنین.
(٢) لەیەکەوە ئاڵان؛ بەیەکداچوون؛ تێك هەڵکێشران.
(٣) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ بە مارپێچی ڕۆیشتن:
*( to ~ in and out through the traffic.)*
*n.* (١) نەخشەی چنین؛ شێوەی تەنین:
*( a loose ~ ; a cloth of English ~ )*
(٢) تەنراو؛ قوماشی چنراو.
**weaver** (wēv'ẽr), *n.* (١) جۆلا. (٢) weaverbird .
**weaverbird** (wēv'ẽr-bũrd'), *n.* باڵندەیەکی بچووکە لە چیلکەو پووش هێلانەکەی دەچنێت.
**web** (web), *n.* (١) تەنراو؛ پارچە قوماشی چنراو.
(٢) تەون؛ تەونی جاڵجاڵۆکە؛ هێلانەی جاڵجاڵۆکەو گیانەوەری تر. (٣) داو.
(٤) شتی هۆنراوە یا هەڵبەستراو بە خەیاڵ: *( a ~ of lies)* .
(٥) تۆڕ؛ کۆمەڵە شتی بەیەکداچوو.
(٦) (ا) پەردەی قاچی قازو مراوی... هتد. (ب) vane # 3
(٧) پەردە (زیندەوەرزانی).
(٨) بەشی تەنراوی تاق لەنێوان تیغەکاندا (خانووسازی).
(٩) (ا) پەرەی کانزایی تەنك یا باریکی نێوان پارچەی قورس و گەورەی مەکینە. (ب) ددانی مشارو کلیل... هتد
(١٠) گورزە کاغەز لە کاتی دروستکردنیدا یا شت لەسەر چاپکردنی و هاتنەدەرەوەی لە مەکینە
*v.t.* (١) چنین؛ تەون کردن. (٢) داپۆشین یا دەورگرتن بە پارچەیەکی تەنراو.
(٣) کردن بە داوەوە؛ داو بۆ نانەوە.
**webbed** (webd), *adj.* تەنراو؛ چنراو؛ پەردەدار؛ بە پەردە پێکەوە نووساو: *( the ~ foot of a duck)* .
**webbing** (web'iŋ), *n.* (١) تیرە قوماشی تەنراوی قایم (بۆ شت دوورینەوەو داگرتنەوە). (٢) شیرازەی بەرەو قاڵی.

(٣) پەردەی قاچی قازو مراوی... هتد.
**webby** (web'i), *adj.* تەونی؛ پەردەیی؛ هۆنراوە؛ چنراو.
**weber** (vā'bẽr, wē'bẽr), *n.* یەکەی هێزی موگناتیسی
**web-foot** (web'foot'), *n.* (١) پێی پەردەدار (قاز، مراوی).
(٢) گیانداری پێ پەردەدار
**web-footed** (web'foot'id), *adj.* پێ پەردەدار.
**webster** (web'stẽr), *n.* [Obs.]. = weaver.
**web-toed** (web'tōd'), *adj.* = web-footed.
**web-worm** (web'wũrm'), *n.* کرمۆکەی تەونکەر: کرمۆکەی هەندێ جانەوەرە تەون دروست دەکات بەسەر ئەو گەڵایەوەی لەسەری دەژی.
**wed** (wed), *v.t.* (١) ژنهێنان و شووکردن؛ ژنهێنان؛ شووکردن.
(٢) لەیەك مارەکردن.
(٣) لێکدان؛ پێکەوەبەستن؛ بەیەك گەیاندن؛ پەیوەستکردن.
*v.i.* ژنهێنان؛ شووکردن.
**we'd** (wēd), (١) we had . (٢) we should . (٣) we would .
**wedded** (wed'id), *adj.* (١) ژندار؛ مێرددار؛ شووکردوو؛ هاوسەردار:
*( the ~ couple; a ~ woman)*
(٢) تایبەتی بە ژنهێنان و شووکردن؛ هی هاوسەرداری: *( ~ bliss)* .
(٣) خۆ بۆ تەرخان کردوو؛ دڵسۆز: *( ~ to one's work)* .
(٤) یەکگرتوو؛ یەك؛ پەیوەست: *( ~ by common interests)*
**wedding** (wed'iŋ), *n.* (١) شایی
(٢) یادی شایی؛ یادی ژنهێنان یا شووکردن: *( a silver ~ ; a golden ~ )*
(٣) پەیوەست؛ یەکگرتن؛ بوون بە یەك.
**wedge** (wej), *n.* (١) پواز (دار قڵیشان)؛ مێخ؛ گوڵ مێخ.
(٢) پارچەی وەك پواز یا مێخ: *( a ~ of pie, cheese, etc.)* .
(٣) نووسینی بزماری کۆن
(٤) (ا) دەستەیەك سەربازە لە شێوەی پوازدا بۆ هێرش بردنە سەر دوژمن (ب) دەستەیەك یاریکەر کە شێوەی پواز وەردەگرن بۆ هێرش بردن لە یاری فوتبۆڵی ئەمەریکیدا.
(٥) جۆرێکە لە سەری ئاسنی گوریزی گۆڵف.
(٦) قڵیشکەر؛ لەتکەر؛ جیاکەرەوە:
*( to drive a ~ between the two friends, brothers, parties, governments, etc.)*
*v.t.* (١) قڵیشاندن؛ لەتکردن (بە پواز)؛ جیاکردنەوە.
(٢) چەسپاندن بە پواز خستنە ژێر یا سەر... هتد.
(٣) ( ~ in )، تێخستن؛ تێ ترنجاندن؛ تێ خزاندن.
*v.i.* تێ ترنجان؛ تێ خزین؛ تێ خزان.
**wedgie** (wej'i), *n.* [Colloq.], جۆرە پێڵاوێکی ژنانەیە بنەکەی یەك پارچەیە وەك پواز قنگە پاژنەکەی ئەستوورەو بەرەبەرە تەنك دەبێتەوە تا لووتەکەی.
**wedgy** (wej'i), *adj.* پوازی؛ مێخی؛ لە پواز دەچێت
**wedlock** (wed'lok), *n.* هاوسەریتی؛ ژنوپیاوێتی
out of wedlock, زۆڵ: *( She was born out of wedlock.)* .
**Wednesday** (wenz'di), *n. Abbr.* wed. چوارشەممە
**wee** (wē), *adj.* (١) زۆر بچووك؛ بچکۆلە.
(٢) زۆر زوو: *( in the ~ hours of the morning)* .
*n.* [Scot.], نەختێك؛ تۆزێك (کات): *( Bide a ~ .)* .
**weed** (wēd), *n.* (١) (ا) بژار؛ گیای زیانبەخش (ب) گژوگیا.
(٢) گەڵا و لاسکی ڕووەك نەك گوڵ و تۆو بەرەکەی: *( dill ~ )* .
(٣) [Colloq.]، (ا) ( the ~ )، توتن. (ب) cigar . (ج) cigarette
(٤) گیاندارێك یا شتێکی بێ فەڕ (بەتایبەتی ماین یا ئەسپێکی ڕیوەڵەی بەکاری زاوزێ نەهاتوو).
(٥) [Slang]، marijuana
*v.t.* (١) بژارکردن: *( to ~ the garden)* .
(٢) ( ~ out )، شتی زیانبەخش فڕێدان یا لێ دەرهێنان؛ پاك کردنەوە لە شتی

ناپەسەند (٣) (out ~)، لە بێژنگ دان؛ تەتەڵەکردن؛ لابردن یا جیاکردنەوەی ئەوەی بێ کەڵکە؛ بژارکردن (مەجاز)

*( to ~ out unqualified applicants for the job)*

*v.i.* بژارکردن

**weed** (wēd), *n.* (١) [Archaic]، جل؛ بەرگ

(٢) (*pl.*) جلی شین یا پرسە (بەتایبەتی هی بێوەژن)

(٣) بازووبەندی ڕەش (بۆ پرسە).

**weeder** (wēd′ẽr), *n.* (١) بژارکەر (مرۆڤ). (٢) ئامێری بژارکەر.

**weed-killer** (wēd′kil′ẽr), *n.* بژارکوژ (دەرمان)

**weedy** (wēd′i), *adj.* (١) بژاراوی؛ گژوگیایاوی؛ بژار هەمووی گرتۆتەوە

(٢) وەك بژار وایە لە زوو پەرەسەندندا.

(٣) ڕیوەڵە؛ سیسەڵە؛ لەڕولاواز *( a carriage with its two ~ horses)* .

-weedily *(adv.)*; weediness *(n.)*.

**week** (wēk), *n.* (١) (أ) هەفتە؛ حەوت ڕۆژ *( a ~ of rain)* .

(ب) هەفتە (بەپێی ساڵنامە، واتە لە یەك شەممەوە بۆ شەممەی داهاتوو):

*( this ~ )*

(٢) ڕۆژانی ئیشکردنی هەفتە

*( She works a 3-day ~ . He works a 40-hour ~ .)*

(٣) (أ) هەفتەیەك لەمەودوا لە ڕۆژێکی دیاریکراوەوە.

(ب) هەفتەیەك لەمەوپێش لە ڕۆژێکی دیاریکراوەوە

*( It was Saturday a ~ that we last met.)*

**week after week,** هەموو هەفتەیەك؛ هەفتە لەدوای هەفتە.

**week by week,** هەفتە هەفتە؛ هەفتە بە هەفتە

**week in, week out,** هەموو هەفتەیەك

**weekday** (wēk′dā′), *n.* (١) هەموو ڕۆژێکی هەفتە جگە لە یەك شەممە.

(٢) هەموو ڕۆژێکی هەفتە جگە لە شەممەو یەك شەممە.

**weekend, week-end** (wēk′end′), *n.* کۆتایی هەفتە؛

پشووی کۆتایی هەفتە (کە ڕۆژانی شەممەو یەك شەممە دەگرێتەوە).

*adj.* هی کۆتایی هەفتە؛ لە کۆتایی هەفتەدا ڕووداو *( a ~ visit)* .

*v.i.* کۆتایی هەفتە بردنەسەر *( The ~ed in Paris.)* .

**long weekend,** پشووی درێژی کۆتایی هەفتە. شەممەو یەك شەممەو ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ لە بەرودوایەوە

**week-ender** (wēk′end′ẽr), *n.* (١) گەشتیاری پشووی کۆتایی هەفتە؛ کەسێکە کە هەموو پشووی کۆتایی هەفتەیەك دەچێ بە لایەکدا بۆ گەشت. (٢) جانتای کۆتایی هەفتە (بۆ گەشت).

**weekly** (wēk′li), *adj.* (١) یەك هەفتەیی؛ هەفتەیەك دەخایەنێ.

(٢) هەفتەیی؛ هەفتەی جارێك *( a ~ visit, meeting, etc.)* .

(٣) هەفتانە؛ هی هەفتەیەك *( a ~ wage)* .

*adv.* هەفتەیی؛ هەر هەفتەی جارێك *( They meet ~ .)* .

*n.* گۆڤاری هەفتەیی؛ هەفتەنامە.

**ween** (wēn), *v.i. & v.t.* [Archaic], وا زانین؛ وا دانان؛ وا بڕوابوون یا بیرکردنەوە

**weenie, weeny** (wē′ni), *n.* [Colloq.], wiener.

**weeny** (wē′ni), *adj.* [Colloq.]. زۆر بچووك؛ بچکۆلە. (هەروەها " wee ").

**weep** (wēp), *v.i.* (١) گریان؛ بە کوڵ گریان؛ فرمێسك ڕشتن؛ لاوانەوە؛ شیوەن کردن (٢) (for ~)، بۆ گریان؛ بۆ لاوانەوە؛ شیوەن بۆ کردن.

(٣) ئاو لێ تکان *( Cold pipes ~ in hot weather.)* .

(٤) ئاودزکردن (برین)؛ ئاوتێزان؛ ئاو دەردان؛ شێلە دەردان (ڕووەك)؛ دەڵاندن

*v.t.* (١) بۆ گریان؛ شیوەن بۆ کردن؛ بۆ لاوانەوە.

*( She wept her misfortune.)*

(٢) فرمێسك ڕشتن؛ دەردان (ئاو، شلە).

(٣) وا لە خۆ کردن بە گریان *( She wept herself to sleep.)*

*n.* (١) (*pl.*) گریانی بە کوڵ؛ گریان؛ شین؛ لاوانەوە

(٢) ئاوتێزان؛ ئاودز؛ دەڵان.

**weep** (wēp), *n.* = lapwing.

**weeper** (wēp′ẽr), *n.* (١) کەسێکی گریاو؛ گرینۆك.

(٢) شیوەنکەری بە کرێ گیراو.

(٣) بازووبەندی ڕەشی پرسە؛ نیشانەی پرسە.

(٤) بۆری ئاوەڕۆی ناو دیوار.

**weeping** (wēp′iŋ), *n.* گریان؛ بە کوڵ گریان؛ گریانی بە کوڵ.

*adj.* (١) گریاو؛ فرمێسك لەچاو؛ فرمێسکاوی.

(٢) لق وپۆپ شۆڕبووەوە (وەك شۆڕەبی): *( a ~ willow)* .

**weeping willow,** شۆڕەبی.

**weepy** (wēp′i), *adj.* گریاو؛ گرینۆك؛ فرمێسك لەچاو.

**weever** (wē′vẽr), *n.* ماسییەکی دەریا گەرمەکانە.

**weevil** (wē′v'l), *n.* سووس: جۆرە جانەوەرێکە دەغڵودان و میوەو پەموو ڕووەك و درەخت دەخوات و دەیفەوتێنێ؛ جانەوەرێکە دەداتە دانەوێڵەی عەمارکراو و دەیفەوتێنێ.

**weevily, weevilly** (wē′v'l-i), *adj. Also* weevil(l)ed, سووس تێداو.

**weft** (weft), *n.* (١) woof . (٢) تەنراو؛ قوماشی چنراو؛ قوماش.

**weigela** (wi-jē′lə, wi-gē′lə), *n.* بنچکێکە لە توخمی " پەنجەی خانم " گوڵی ڕەنگاوڕەنگ دەگرێت.

**weigh** (wā), *v.t.* (١) کێشان *( How often do you ~ yourself?)* .

(٢) هەڵسەنگاندن بە دەست *( I ~ed the stone in my hand.)* .

(٣) (out ~)، پێوان؛ بەش بەش کردن بە پێوان یا کێشان:

*( to ~ out butter, sugar, etc.)*

(٤) (أ) باش بیرلێکردنەوە؛ کێشان (مەجاز): *( to ~ one's words)* .

(ب) بەراوردکردن؛ لێکۆڵینەوە پێش هەڵبژاردن:

*( to ~ one plan against another)*

(٥) (down ~)، بار گران کردن؛ پساندن؛ ئەرك خستنە سەر؛ نەواندن:

*( The fruit ~ed the branches down.)*

(٦) بەرزکردنەوە؛ بڵندکردنەوە؛ هەڵبڕین؛ هەڵکردن *( to ~ anchor)* .

(٧) [Obs.]، ڕێزگرتن؛ بایەخ پێدان؛ بە بەنرخ دانان.

*v.i.* (١) قورسایییەکی تایبەتی بوون؛ ئەوەندە قورس بوون:

*( It ~s ten pounds.)*

(٢) گرنگ بوون؛ بە بایەخ بوون؛ کارتێکردن:

*( His words ~s heavily with me. His evidence did not ~ much with the judge.)*

(٣) (on; ~ upon ~)، ئەرك یا بارێکی گران بوون؛ بە لاوە گران بوون؛ مێشك ماندووکردن:

*( The theft ~ed on his mind. Responsibility ~ed upon him.)*

(٤) (أ) لەنگەر هەڵکردن

(ب) کەوتنە ڕێ بە دەریادا؛ دەست بە گەشت کردن بە کەشتی.

**weigh in,** (١) (خۆ) کێشانی بۆکسباز پێش دەستپێکردنی بۆکسبازی؛ (خۆ) کێشانی سوار پێش پێشبڕکێی غارغارێن.

(٢) جانتا کێشان (لە فڕۆکەخانە پێش سواربوونی فڕۆکە).

**weigh one's words,** ئاگا لە دەمی خۆ بوون؛ وورریای دەمی خۆ بوون؛ باش بیرکردنەوە پێش قسەکردن.

**weigh** (wā), *n.* = way # 9.

**weight** (wāt), *n.* (١) قورسی؛ قورسایی.

(٢) کێشانە؛ سەنگ؛ کێش:

*( The pound is a common ~ in English speaking countries.)*

(٣) شتێکی قورس: (أ) بۆ خستنە سەر کاغەز بۆ ئەوەی با نەیبات:

*( a paper ~ )*

(ب) بۆ بەرزکردنەوەو ماسولکە بەهێزکردن *( to lift ~s)* .

(٤) بار *( Put down that ~ and rest your arms.)* .

(٥) ئەرکی سەر شان؛ ئەرك *( the ~ of responsibility)* .

(٦) گرنگی؛ بایەخ

*( an opinion of great ~ ; a matter of great ~ )*

(٧) ئەستووری‌و قورسی‌و گەرمی جل‌وبەرگ: *( a winter- ~ jacket)* .

(٨) تۆخی‌و قەڵەوی تیپی چاپەمەنی.

(٩) ئەندازەی قورسی بۆکسبازو زۆرانباز:

*( the heavy- ~ champion; a heavy- ~ match)*

***v.t.*** (١) قورس کردن؛ سەنگ زیادکردن.

(٢) ئەرکی زیادە خستنە سەر شان؛ بار قورس کردن؛ پساندن؛ پەستانەوە.

(٣) ئەستوورو قورس کردنی قوماش (بە لێدانی ماددەیەکی کیمیایی).

**by weight,** بە کێشانە؛ بە کێشان: *( Fruit is sold by weight.)* .

**carry weight,** گرنگ بوون؛ بە بایەخ بوون:

*( His opinion will carry weight.)*

**pull one's weight,** بەشی خۆ ئیشکردن، پارەدان، یا بەشداربوون لە کارێکدا:

*( We will finish the work on time if everyone pulls his weight.)*

**put on weight,** قەڵەوبوون

**throw one's weight around,** خۆفشکردنەوە؛ خۆنواندن؛ خۆ زۆر بە زل زانین:

*( The new director is throwing his weight around.)*

**weightless** (wāt′lis), ***adj.*** بێ سەنگ؛ بێ قورسایی؛ بێ کێش؛ زۆر زۆر سووک.

**-weightlessly** ***(adv.)***; **weightlessness** ***(n.).***

**weight-lifter** (wāt′lif′tēr), ***n.*** قورسایی بەرزکەرەوە (وەرزش).

**weight-lifting** (wāt′lif′tiŋ), ***n.*** قورسایی بەرزکردنەوە (وەرزش).

**weighty** (wāt′i), ***adj.*** (١) قورس؛ بەکێش.

(٢) گران (ئەرک، بار)؛ ناخۆش: *( ~ responsibilities)* .

(٣) زۆر گرنگ: *( ~ matters)* .

(٤) زۆر بەدەسەڵات؛ گرنگ؛ بەرز (مرۆڤ): *( a ~ personage)* .

(٥) گرنگ؛ کاردەکاتە سەر ئەنجامی مەسەلەکە:

*( a ~ reson, argument, evidence, etc.)*

**-weightily** ***(adv.)***; weightiness ***(n.).***

**weir** (wêr), ***n.*** (١) بەنداوی رووبارێکە بۆ پەنگ خواردنەوەی ئاوەکە یا ئاو لێ راکێشانی؛ بەست؛ بەند. (٢) تەیمان (لە ناو جۆگەدا دەکرێ بۆ ماسی گرتن). (٣) ئاوبارە (بۆ پێوانی خێرایی ئاو).

**weird** (wêrd), ***adj.*** (١) ناسرووشتی؛ نائاساو ترسناک؛ تایبەتی بە خێوو دێوودرنج. (٢) [Colloq.]، سەیر؛ نائاسایی:

*( He wore a ~ costume.; a ~ person)*

(٣) [Archaic]، چارەنووسی؛ بەختی.

***n.*** [Scot. or Archaic], (١) چارەنووس؛ بەخت.

(٢) فریشتەی بەخت (کە سیانن). (٣) پێشبینی. (٤) نوشتە؛ جادوو.

**-weirdly** ***(adv.)***; weirdness ***(n.).***

**weirdie, weirdy** (wêrd′i), ***n.*** [Slang], = weirdo.

**weirdo** (wêr′dō′), ***n.*** [Slang]. کەسێکی زۆر سەیرو نەگونجاو لەگەڵ دەوروبەریدا: *( He's a ~ .)* .

**weka** (wā′kä, wē′kə), ***n.*** باڵندەیەکی نیوزیلەندی گەورەی کونجی قاوەییە ناتوانێ بفڕێ

**Welch** (welch, welsh), ***adj. & n.*** = Welsh.

**welch** (welch, welsh), ***v.t. & v.i.*** [Slang], = welsh.

**welcome** (wel′kəm), ***adj.*** (١) بەخێرهاتوو؛ خۆشەویست؛ بە خۆشییەوە پێشوازی لێکراو: *( a ~ guest)* .

(٢) خۆش؛ باش؛ دڵخۆشکەر: *( ~ news)* .

(٣) بە گەرمییەوە بانگ کراو بۆ شتێک: *| You are ~ to (use) my car. |* .

***n.*** بەخێرهاتن؛ خۆش هاتن: *( a warm ~ ; a cold ~ )* .

***interj.*** بەخێربێی؛ خۆش هاتی!؛ بەخێربێن!.

***v.t.*** (١) بەخێرهاتن کردن؛ پێشوازی کردن:

*( She ~d him to her home.)*

(٢) پێ خۆش بوون: *( He always ~s criticism.)* .

**-welcomer** ***(n.).***

**bid welcome,** بەخێرهاتن کردن.

**wear out one's welcome,** ئیتر بەخێرهاتن ناکرێ؛ بێزاربوونی خانەخوێ بە زۆر مانەوەی میوانێک یا زوو زوو هاتنی.

**you're welcome,** شایانی نییە. (وەڵامە بۆ ووتەی " **thank you** " ) .

**weld** (weld), ***v.t.*** (١) لکاندن؛ پەیوەستکردن؛ لەحیم کردن؛ جۆش کردن.

(٢) کردن بە یەک؛ یەک پێگرتن؛ لێکدان.

***v.i.*** لکان؛ پەیوەستکران؛ لەحیم کران؛ جۆش دران.

***n.*** (١) لکان؛ پەیوەست؛ لەحیم؛ جۆشکاری؛ لەحیمکاری.

(٢) شوێنی لکان یا لەحیم؛ شوێنی لەحیم کراو: *( It broke at the ~ .)*

**weld** (weld), ***n.*** (١) رووەکێکە رەنگی زەردی لێ دەگیرێ.

(٢) ئەم رەنگە یا بۆیەیە.

**welder** (weld′ēr), ***n.*** (١) لەحیمچی؛ لەحیمکەر

(٢) ئامێری لەحیمکاری. (هەروەها " **weldor** " ) .

**weldment** (weld′mənt), ***n.*** شتێکە لە چەند پارچەیەکی پێکەوە لەحیم کراو پێکهاتبێ.

**welfare** (wel′fâr′), ***n.*** (١) خێروخۆشی؛ خۆش گوزەرانی؛ بەختیاری؛ خۆشی. (٢) **welfare work** .

(٣) (ا) دەزگای یارمەتیدانی دارایی‌و دەستگیرۆیی هەژاران (کە دەزگایەکی میرییە). (ب) ئەم یارمەتی دارایی‌و دەستگیرۆییە.

***adj.*** (١) تایبەتی بە خێروخۆشی‌و دەستگیرۆیی هەژاران:

*( ~ legislation)*

(٢) یارمەتی وەرگر لە دەزگای دەستگیرۆیی هەژارانەوە، واتە لە میرییەوە

*( ~ mothers)*

**on welfare,** دەستگیرۆیی دەکرێن لەلایەن میرییەوە:

*( Many families are on welfare now.)*

**welfare state,** (١) رژێمێکی کۆمەڵایەتییە کە میری خێروخۆشی‌و دەستگیرۆیی هاووڵاتیان دەگرێتە ئەستۆی خۆی.

(٢)ووڵاتێکە لەسەر ئەم رژێمە بڕوات.

**welfare work,** کاری دەستگیرۆیی هەژاران؛ ئیشی خۆش گوزەرانی کۆمەڵ.

**welkin** (wel′kin), ***n.*** (١) [Archaic]، ئاسمان:

*( Make the ~ ring.)*

(٢) بۆشایی ئاسمان.

**well** (wel), ***n.*** (١) کارێز؛ کانی؛ کانیاو (٢) بیر.

(٣) سەرچاوەی بێ پایان؛ سەرچاوە: *( He is a ~ of information.)*

(٤) (ا) بۆشایی دەوری پێ پلیکانەی ناو خانوو. (هەروەها " **stairwell** " ) .

(ب) بۆشایی دەوری ئەسانسێر.

(ج) شوێنی دانیشتنی پارێزەر لەبەردەم دادوەردا.

(د) ژووری ترومپای کەشتی.

(٥) دەفری شلە؛ شووشە: *( an ink ~ )* .

***v.i.*** (١) لێ هاتن؛ لێ رژان؛ پەنگ خواردنەوەو لەبەر رۆیشتن؛ فیچقەکردن.

*( Tears ~ed up in her eyes.)*

(٢) پەنگ خواردنەوە. *( Longing ~ed up in his breast.)*

***v.t.*** لێوەهاتن؛ لێ رژان؛ فیچقەکردن:

*( a fountain ~ing its pure water)*

**well** (wel), ***adv.*** (١) بە باشی: *( The affair ended ~ .)* .

(٢) بە جوانی؛ بە رووخۆشی؛ باش: *( Treat her ~ .)* .

(٣) لێهاتووانە؛ لێزانانە؛ جوان؛ چاک؛ خۆش: *( She sings ~ .)*

(٤) بەجێ؛ دروست *( spoken ~ )*

(٥) باش؛ بە خۆش گوزەرانی؛ بە پارەداری: *( They lived ~ in Paris.)* .

(٦) رەوا؛ بۆی هەیە؛ زۆرباش: *( You may ~ ask.)* .

(٧) ساغ؛ تەندرووست؛ باش: *( The patient is doing ~ .)* .

(٨) زۆر، تا رادەیەکی زۆر: *( They are ~ ahead of us.)* .
(٩) بە تەواوی باش: *( Stir ~ before cooking.)* .
(١٠) بێ گومان؛ بە دڵنیایی:
*( You know prefectly ~ that she was there.)*
(١١) باش *( I know him ~ .)* .
(١٢) بە دڵ و مێشکێکی کراوەوە؛ بەبێ پەست بوون:
*( He took the news ~ . )*
*adj.* (١) باش، گونجاو؛ شیاو: *( It is ~ that you come.)* .
(٢) لەش ساغ، تەندرووست: *( She is quite ~ .)*
(٣) بهات، باش: *( Things are well with us these days.)* .
*interj.* (١) ووتەیەکە سەرسامی، پەسەندکردن، ناچاری... هتد دەردەبڕێ.
(٢) ووتەیەکە بیری تازە، وەڵام، یا تێبینی پێ پێشکەش دەکرێ:
*( W~ , as I was saying.... W~ , it may be true.*
*W~ who would have thought it?)*
**as well,** (١) هەروەها، سەرەڕای ئەوەیش؛ زیاد لەوەیش؛ — یش.
(٢) وا باشە کە، وا باشترە:
*( Since you're so obstinant I might as well leave.)*
**as well as,** (١) هەروەها، سەرەڕای ئەوەیش؛ — یش.
(٢) وەك؛ ئەوەندە باش، وەك ئەو باش؛ هەر وەك:
*( He did as well as you.)*
(٣) ئەوەندە؛ بە هاوتا: *( He would like to go as well as you.)* .
**Let ( or leave ) well enough alone,** دەستکاری شتێك مەکە کە پێویستی بە دەستکاری نییە؛ واز لە شتێك بێنە کە خۆی لە خۆیدا باشەو دەستکاری ناوێ

**we'll** (wēl), = we will; we shall.
**welladay** (wel'ə-dā´), *interj.* [Archaic], = wellaway.
**well-advised** (wel'əd-vīst´), *adj.* بەجێ؛ درووست؛ باش، پەسەند؛ ژیرانە: *( a ~ plan, action, response, etc.)* .
**well-appointed** (wel'ə-poin´tid), *adj.* بێ کەموکووڕی؛ باش و رێك‌وپێك؛ کەرەسەو شتومەك و تفاقی تەواوی تێدایە:
*( a ~ room, office, etc.)*
**wellaway** (wel'ə-wā´), *interj.* [Archaic], *Also* **welladay,** ئاخ لە خۆم!؛ هەی هاوار!؛ داخەکەم!
**well-balanced** (wel'bal´ənst), *adj.* (١) رێك‌وپێك، هاوسەنگ:
*( a ~ diet)*
(٢) ژیر؛ سەنگین، هێمن: *( a ~ temper, mind, etc.)* .
**well-behaved** (wel'bi-hāvd´), *adj.* ڕەووشت جوان؛ بە ڕەووشت
**well-being** (wel'bē'iŋ), *n.* خۆشی؛ خێروخۆشی؛ ئاسوودەیی؛ کامەرانی، چاکە: *( I always had their ~ in mind.)* .
**well-born** (wel'bôrn'), *adj.* خانزادە، ڕەسەن، خانەدان
**well-bred** (wel'bred'), *adj.* (١) ڕەفتار جوان؛ بە ڕەووشت؛ بە نەژاکەت (٢) ڕەسەن (گیاندار): *( a ~ horse, dog, etc.)* .
**well-chosen** (wel'chō'z'n), *adj.* باش هەڵبژێراو؛ شیاو، گونجاو؛ باش.
**well-clad** (wel'klăd'), *adj.* = **well-dressed.**
**well-defined** (wel'di-fīnd'), *adj.* باش دیاریکراو؛ ڕوون؛ لێلی تێدا نییە *( ~ policies)*
**well-disposed** (wel'dis-pōzd'), *adj.* هاوسۆز، ڕووخۆش، هەستی یارمەتیدانی هەیە؛ حەز بە پشتگیری دەکات:
*( She was ~ toward him.)*
**well-doer** (wel'doo'ēr), *n.* چاکەکەر، کاری خێرکەر.
**well-done** (wel'dun'), *adj.* (١) زۆر باشە، زۆر باش کراوە؛ زۆر جوان کراوە
(٢) باش کوڵاو یا برژاو *( a ~ steak, hamburger, etc.)* .
(ووشەی rare ببینە)

*interj.* ئافەرم!؛ زۆر باشە!.
**well-dressed** (wel'drest'), *adj.* پۆشتە؛ پۆشتەوپەرداخ؛ تەڕپۆش.
**well-favored, well-favoured** (wel'fā'vērd), *adj.* جوان؛ قۆز؛ شۆخ
**well-fed** (wel'fed'), *adj.* (١) تێروتەسەل. (٢) قەڵەو؛ دابەستە.
**well-found** (wel'found'), *adj.* کەرەسەی تەواوی هەیە؛ ڕەختدار:
*( a ~ ship)*
**well-founded** (wel'foun'did), *adj.* بەڵگەدار؛ ڕەوا؛ بنچینەدار؛ ڕاست؛ بێ هۆ نییە: *( a ~ suspicion, ~ fears)* .
**well-groomed** (wel'groōmd'), *adj.* (١) ڕنەك کراو؛ ڕێك‌وپێك:
*( a ~ horse)*
(٢) ڕێك‌وپێك؛ تەڕپۆش؛ پۆشتەو پاك‌وتەمیز: *( a ~ person)* .
(٣) باش ڕاگیراو؛ جوان و ڕێك‌وپێك: *( a ~ lawn)* .
**well-grounded** (wel'groun'did), *adj.* (١) پتەو؛ تێگەیشتوو؛ شارەزا (لە ڕشتەیەکدا). (٢) **well-founded** .
**well-handled** (wel'han'd'ld), *adj.* (١) باش بەڕێوەبراو؛ باش؛ هەڵسووڕێنراو. (٢) زۆر دەستکاری کراو.
**well-head** (wel'hed'), *n.* (١) کانی؛ کانیاو؛ کارێز؛ سەرچاوەی کارێز. (٢) سەرچاوە.
**well-heeled** (wel'hēld'), *adj.* [Slang]. دەوڵەمەند؛ پارەدار؛ ساماندار: *( a ~ community, person, etc.)* .
**well-informed** (wel'in-fôrmd'), *adj.* بەڵەد؛ زانا؛ شارەزا؛ تێگەیشتوو؛ ئاگادار.
**well-intentioned** (wel'in-ten'shənd), *adj.* = **well-meaning.**
**well-knit** (wel'nit'), *adj.* (١) باش دارێژراو:
*( a ~ plot, story, drama)*
(٢) پتەو؛ باش دارێژراو: *( a ~ body)*
(٣) کۆك؛ نزیك (پەیوەندی کۆمەڵایەتی)؛ یەکگرتوو:
*( a ~ family, group, society, etc.)*
(٤) سفت‌وسۆڵ؛ پتەو.
**well-known** (wel'nōn'), *adj.* (١) بەناوبانگ؛ ناودار؛ ناسراو؛ بەناو. (٢) زانراو؛ باش زانراو؛ ئاشکرا: *( a ~ fact, story, etc.)* .
**well-made** (wel'mād'), *adj.* (١) باش درووستکراو؛ باش کراو؛ پتەو. (٢) باش دارێژراو: *( a ~ play or novel)* .
**well-mannered** (wel'man'ērd), *adj.* ڕەفتار جوان؛ بە ڕەووشت؛ بە نەژاکەت
**well-meaning** (wel'mēn'iŋ), *adj.* دڵپاك؛ نیاز پاك؛ مەبەست یا نیازی باشە: *( a ~ but tactless person)* .
**well-meant** (wel'ment'), *adj.* لە دڵپاکییەوە کراو؛ بە نیاز یا مەبەستی باشەوە کراو.
**wellness** (wel'nis), *n.* لەش ساغی؛ تەندرووستی؛ چاکی.
**well-nigh** (wel'nī'), *adv.* نزیکی؛ نزیکەی؛ خەریکە:
*( It's ~ bedtime.)*
**well-off** (wel'ôf'), *adj.* (١) بەختەوەر؛ لە بارودۆخێکی باشدایە:
*( If a person has his health, he is ~ .)*
(٢) خۆش گوزەران؛ تێروتەسەل؛ نیمچە دەوڵەمەند.
**well-read** (wel'red'), *adj.* زۆر خوێندەوار؛ زۆری خوێندۆتەوە:
*( He is ~ in history. a ~ person)*
**well-spoken** (wel'spō'kən), *adj.* (١) زمانپاراو، زمان ڕەوان.
(٢) قسەخۆش، زمان شیرین
(٣) لە جێی خۆیدا ووتراو؛ لە کاتی خۆیدا ووتراو؛ بەجێ.
**well-spring** (wel'spriŋ´), *n.* (١) کانی؛ کانیاو؛ سەرچاوەی ئاو.
(٢) سەرچاوە؛ سەرچاوەی بێ پایان: *( a ~ of knowledge)*
**well-thought-of** (wel'thôt'uv'), *adj.* ناوبانگ چاك، بەناو

بەرێز

**well-timed** (wel'tīmd'), *adj.* لە کاتی خۆیابەتی
*( a ~ remark)*
**well-to-do** (wel'tə-doo'), *adj.* خۆش گوزەران؛ تێروتەسەل؛ نیمچە دەوڵەمەند
**well-wisher** (wel'wish'ēr), *n.* خێرخواز؛ چاکخواز
**well-worn** (wel'wôrn', wel'wōrn'), *adj.* (١) دڕاو؛ کۆن؛ زۆر لەبەرکراو؛ شڕووڕ؛ پڕواو. (٢) پەڕپووت؛ کۆن؛ سواو. *( a ~ joke)* .
**Welsh** (welsh, welch), *adj.* وێلزی. تایبەتی بە زمان و گەل و کلتووری ناوچەی وێلز لە ئینگلتەرە
*n.* وێلزی. زمانی وێلزی
the Welsh, گەلی وێلز؛ خەڵکی وێلز؛ وێلزییەکان
**welsh** (welsh), *v.t. & v.i. Also* welch, (١) دەستبڕین و قەرز نەدانەوە؛ سەرچەوتی کردن. (٢) ( on ~ ): پەیمان شکاندن؛ پەیمان نەبردنە سەر. خۆدزینەوە لە بەڵێنێک.
**Welsh corgi,** توحمە سەگێکی وێلزی گوێ قوتی قاچ کورتە سەری لە هی ڕێوی دەچێ
**welsher** (wel'shēr), *n.* [Slang], دەستبڕ، ساختەچی؛ سەرچەوت؛ تەڵەکەباز
**Welshman** (welsh'mən, welch'mən), *n.* وێلزی؛ هاوولاتییەکی وێلز (لە ئینگلتەرە). (هەروەها " Welchman ").
**Welsh rabbit,** *Also* Welsh rarebit, خواردەمەنییەکە بریتییە لە پەنیری تواوە بەسەر نان یا پسکیتەوە
**Welsh terrier,** جۆرە سەگێکی وێلزی تووک لوول ڕەش و سوورکەلەیە.
**welt** (welt), *n.* (١) تیلماسکێکی چەرمە بە چواردەوری پێڵاودا نێوانی بنی پێڵاو و سەرەکەی پێ دادەگیرێتەوە؛ شیرازە. (٢) پەراوێز. (٣) (ا) شوێنی نیشانەی قامچی و دار لێدان بە پێستەوە. (ب) لێدان (بە قامچی، دار).
*v.t.* (١) پەراوێز بۆ کردن؛ داگرتنەوە؛ هەڵبەستن؛ شیرازە بۆ کردن. (٢) [Colloq.]: بیرازکردن؛ زۆر لێدان؛ تێهەڵدان؛ کوتان.
**welter** (wel'tēr), *v.i.* (١) (ا) خۆگەوزاندن؛ تەپاوتل کردن؛ تلانەوە؛ تلاوتل کردن. (ب) تێدا گەوزان (مەجاز)؛ تیا نوقوم بوون؛ زۆر کردن:
*( They ~ed in sin.)*
(٢) لە خەڵتانی خوێندا گەوزان؛ تێدا گەوزان؛ نوقوم بوون تێیدا:
*( The corpses ~ed in their blood.)*
(٣) شەپۆل دان؛ هەڵسان و شکانەوە (شەپۆل)؛ لێشاو هێنان؛ هەڵچوون.
*n.* (١) کۆمەڵێکی تێکەڵ و پێکەڵی شێواو:
*( a ~ of anxious faces, conflicting opinions, data, etc.)*
(٢) پشێوی. پاشاگەردانی
(٣) هەڵسان و شکانەوە (شەپۆل)؛ تەپاوتل؛ لێشاو.
**welterweight** (wel'tēr-wāt'), *n.* (١) سەنگێکی بیست و هەشت پاوەندییە هەندێک جار دەخرێتە سەر ئەسپی پێشبڕکێ بۆ یەکسانی کردنی پێشبڕکێکە. (٢) بۆکسباز یا زۆرانبازێکە کە قورسایی (١٣٦-١٤٧) پاوەن بێ.
**wen** (wen), *n.* (١) لوو یا تلۆقێکی پڕ چەوری بێ زیانە بە پێستەوە (بەتایبەتی بە پێخی سەرەوە). (٢) [Archaic]. goiter. (٣) [British Slang]، شارێکی زۆر گەورە و قەرەباڵغ.
**wen** (wen), *n.* تیپێکی زمانی ئینگلیزی کۆنە ئێستا گۆڕدراوە بۆ " w "
**wench** (wench), *n.* (١) کچ (لەڕووی سووکییەوە) (٢) [Archaic]. (ا) کچە لادێیی. (ب) کارەکەر (ج) قەحبە؛ ئافرەتی سووک
*v.i.* [Archaic], قەحبەجێتی کردن؛ قەحبەبازی کردن.
-wencher *(n.)*.
**wend** (wend), *v.i.* ڕۆیشتن. بە ڕێی خۆدا ڕۆیشتن؛ چوون؛ ملی ڕێ گرتن
*v.t.* [Poetic]. ڕێی خۆ گرتن؛ ڕۆیشتن؛ چوون *( ~ one's way)* .

**Wendish** (wen'dish), *adj.* وێندی. تایبەتی بە " وێندییەکان " و زمانەکەیان.
*n.* وێندی؛ زمانی وێندی (کە زمانێکی سلاڤی بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیایە).
**went** (went), *past tense of* go.
**wentletrap** (wen't'l-trap'), *n.* قاقلەجنۆکەی پێنچ پێنچۆکە گیاندارێکی دەریاییە لە قاقلەیەکی سپی پێنچ پێنچۆکەدایە.
**wept** (wept), *past tense and past participle of* weep.
**were** (wûr; *unstressed* wēr), (1)- *plural and second person singular of the past indicative of* be., بوون؛ بووین
*( We ~ ; They ~ ; You ~ )*
(2)- *past subjunctive of* be., ئەگەر وا بووایە؛ ئەگەر من بوومایە لەباتی تۆ: *( If I ~ you )* .
**we're** (wēr), = we are.
**weregild** (wûr'gild', wer'gild'), *n.* = wergild.
**weren't** (wûrnt), = were not.
**werewolf** (wûr'woolf'), *n. Also* werwolf, گورگە پیاو (فۆلکلۆر)؛ کەسێکە کە بووە بە گورگ یا دەتوانێ خۆی بکات بە گورگ هەرکات بیەوێت؛ کەسێکی خۆ بە گورگ دانەر (هەروەها " lycanthrope " ).
**wergild** (wûr'gild', wer'gild'), *n. Also* weregild, خوێن بایی (لە نەریتی خێڵە ئەڵمانی و ئەنگلۆ-ساکسۆنەکانی کۆندا).
**wert** (wûrt; *unstressed* wērt), *archaic second person-singular past indicative and subjunctive of* be., وا بوویت:
*( thou ~ )*
**west** (west), *n.* (١) ڕۆژئاوا. (٢) ناوچەیەکی ڕۆژئاوایی. (٣) [W-]، (ا) بەشی ڕۆژئاوای جیهان؛ وولاتانی ڕۆژئاوا. (ب) ئەوروپا و ئەمەریکا. (ج) هەرێمی ڕۆژئاوای وولاتێک.
*adj.* (١) ڕۆژئاوایی؛ بەرەو ڕۆژئاوا؛ بۆ ڕۆژئاوا (٢) ڕۆژئاوایی؛ لە ڕۆژئاواوە. *( a ~ wind)* . (٣) [W-]، هی بەشی ڕۆژئاوای وولاتێک یا کیشوەرێک:
*( W~ Bengal; W~ Africa)*
*adv.* ڕۆژئاوایی؛ بەرەو ڕۆژئاوا؛ بۆ ڕۆژئاوا.
go west, (١) [Colloq.]، مردن؛ کۆچی دوایی کردن. (٢) بەرەو ڕۆژئاوای ئەمەریکا یا جیهان ڕۆیشتن: *( Go west, young man!)* .
the West, بەشی ڕۆژئاوای ئەمەریکا لە ڕووباری میسیسیپی بەولاوە (بەتایبەتی بەشە هەرە ڕۆژئاواییەکان).
**westbound** (west'bound'), *adj.* بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتوو
*( a ~ train, traveller, etc.)*
**wester** (wes'tēr), *v.i.* بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتن؛ ڕووکردنە ڕۆژئاوا.
**westerly** (wes'tēr-li), *adj.* (١) بەرەو ڕۆژئاوا؛ ڕۆژئاوایی (٢) لە ڕۆژئاواوە هاتوو یا هەڵکردوو؛ ڕۆژئاوایی. *( a ~ wind)* .
*adv.* (١) بەرەو خۆرئاوا. (٢) لە خۆرئاواوە: *( The wind blew ~.)*
*n.* بای خۆرئاوا؛ بای خۆرئاوایی.
**western** (wes'tērn), *adj.* (١) خۆرئاوایی؛ بەرەو خۆرئاوا؛ ڕووەو خۆرئاوا. (٢) لە خۆرئاواوە هاتوو یا هەڵکردوو؛ خۆرئاوایی:
*( a ~ wind)*
(٣) [W-]، ڕۆژئاوایی: *( W~ dress; W~ trade agreements; the W~ democracies)*
(٤) [W-]، تایبەتی بە کڵێسەی ڕۆژئاوایی.
(٥) [W-]، تایبەتی بە بەشی خۆرئاوای ئەمەریکا: *( a W~ cowboy)*
*n.* (١) westerner . (٢) فیلمێک یا چیرۆکێکە لە بابەت ژیانی خۆرئاوای ئەمەریکاوە بەتایبەتی هی گاوانی: *( We saw a ~ last night.)*
**westerner** (wes'tēr-nēr), *n.* (١) هاوولاتی یا نیشتەنی وولاتێکی خۆرئاوایی. (٢) [W-]. هاوولاتی یا نیشتەنی بەشی ڕۆژئاوای ئەمەریکا
**Western Hemisphere,** نیوەی خۆرئاوای گۆی زەوی (کە هەردوو ئەمەریکا دەگرێتەوە)؛ نیوەی زەمینی ڕۆژئاوا.

**westernism** (west′ẽrn-iz′m), *n.* ڕۆژاوایەتی؛ ووتەیەك، نەریتێك، یا کردەوەیەکی ڕۆژاوایییانە.

**westernize** (wes′tẽrn-īz′), *v.t.* وەك ڕۆژاوایی لێکردن؛ بە خوو نەریت و هەست و بیرو ڕۆشنبیری خۆراواییانە پەروەردەکردن: *( to ~ someone)*

*v.i.* وەك ڕۆژاوایی لێهاتن؛ ڕۆشنبیریی و خو و ڕەووشت و نەریت و بیری خۆراواییانە گرتن.

**-westernization** *(n.)*.

**westernmost** (wes′tẽrn-mōst′), *adj.* ئەوپەڕی خۆراوا

**westing** (wes′tiŋ), *n.* (١) ئەو مارەیەی کەشتییەك دەیبڕێ بەرەو خۆراوا. (٢) ڕۆیشتن بەرەو خۆراوا.

**westward** (west′wẽrd), *adj. & adv.* بەرەو خۆراوا

*n.* (١) ناوچەیەکی ڕۆژاوا. (٢) ڕێڕەوێکی بەرەو ڕۆژاوا.

**westwardly** (west′wẽrd-li), *adj. & adv.* (١) بەرەو ڕۆژاوا *( a ~ direction)*

(٢) ڕۆژاوایی؛ لە ڕۆژاواوە هاتوو یا هەڵکردوو: *( a ~ wind)* .

**westwards** (west′wẽrdz), *adv.* = westward.

**wet** (wet), *adj.* (١) تەڕ؛ شێدار.

(٢) تەڕ؛ ووشك نەبووەتەوە: *( ~ paint)* .

(٣) باراناوی؛ تەمومژاوی: *( a ~ day; ~ weather)* .

(٤) لە ناو یا شلەیەکی تردا هەڵگیراو.

(٥) بە ناو یا شلەی تر گیراوەتەوە.

(٦) (ا) شەراب و خواردنەوەی مەستکەری تری تێدا دەفرۆشرێت: *( a ~ country, town, etc.)*

(ووشەی " dry " ژمارە یانزە ببینە).

(ب) لایەنگری شەراب و خواردنەوەی مەستکەری تر فرۆشتن: *( a ~ candidate for the city council)*

(٧) [Slang]، (ا) سەرخۆش؛ مەست

(ب) هی خواردنەوەیە؛ بۆ خواردنەوە دانراوە: *( a ~ night)* .

*n.* (١) تەڕی؛ شێ: *( The ~ from the earth had made the basement unlivable.)*

(٢) باران؛ ئاووهەوای شێدار یا باراناوی.

(٣) لایەنگری دروستکردن و فرۆشتنی شەراب و خواردنەوەی مەستکەری تر.

*v.t.* (١) تەڕکردن.

(٢) میز پێداکردن؛ میز بە خۆدا کردن: *( The dog had ~ the carpet. to ~ one's pants.)*

*v.i.* تەڕبوون

**all wet**, [Slang]. هەڵە؛ بە هەڵەدا چوو؛ هەمووی یا بە تەواوی هەڵەیە: *( Their ideas are all wet.)*

**wet behind the ears**, نەزان؛ نەشارەزا؛ نەوکار

**wet one's whistle**, شەراب خواردنەوە؛ دەم تەڕکردن؛ قومێك خواردنەوە.

**wetback** (wet′bak′), *n.* [Colloq.], مەکسیکییەکە کە بە دزییەوە دەچێتە ناو ئەمەریکاوە (بەتایبەتی بۆ کرێکاری و وەرزێری).

**wet blanket**, [Colloq.], کەسێکە کە حەز لە کەیف و زەماوەند ناکات و لە خەڵکی تریشی تاڵ بکات؛ خەڵك ساردکەرەوە.

**wet down**, ئاو لێ هەڵپرژاندن؛ ئاوڕشێن کردن؛ تەڕکردن.

**wet dream**, شەیتانی؛ شەیتانی بوون: *( to have a ~ )* .

**wether** (we*th*′ẽr), *n.* بەرانی خەساو.

**wetland** (wet′land′), *n. usually plural*, زەلکاو (بەتایبەتی کە دانرابێ بۆ مەل و گیانداری تر)؛ زۆنگاو.

**wetness** (wet′nis), *n.* تەڕی؛ شێداری.

**wet-nurse** (wet′nũrs′), *v.t.* (١) دایەنی کردن

(٢) لاواندنەوە و بە دەورووقنگدا هاتن.

**wet nurse**, (١) دایەن

(٢) کەسێکە کە زۆر کەسێکی تر دەلاوێنێتەوە و بە دەورووقنگیدا دێت.

**wet pack**, پەڕۆ بەتانیەی تەڕی نەخۆش تێوە پێچراو.

**wettish** (wet′ish), *adj.* نەختێك تەڕ.

**we've** (wēv), = we have.

**whack** (hwak), *v.t. & v.i.* (١) [Colloq.] ، بە توند لێدان؛ زرمە لێ هەڵسان؛ زللە لێدان؛ شەپازلە پیاماڵین؛ پیاکێشان.

(٢) [Slang]، ( ~ up )، بەشکردن؛ دابەشکردن.

(٣) [British]، بەزاندن.

*n.* (١) [Colloq.] ، (ا) شەپازلە؛ زللە؛ پیاکێشان. (ب) دەنگی شەپازلە؛ زرمە.

(٢) [Slang]، هەوڵ کردنی شتێك؛ تاقیکردنەوە

(٣) [Slang]، بەش.

(٤) [Slang]، باش گەڕان یا ئیشکردن: *( The motor is out of ~ .)* .

**have ( or take ) a whack at**, [Colloq.], دەستی خۆ پێ تاقیکردنەوە؛ تاقیکردنەوە.

**out of whack**, [Colloq.], تێکچوو: *( My stomach is out of whack.)*

**whacking** (hwak′iŋ), *adj.* [Chiefly British Colloq.], زۆر زل: زل: *( a ~ lie)* .

*adv.* [Chiefly British Colloq.], زۆر.

**whack up**, دابەشکردن؛ بەشکردن.

**whacky** (hwak′i), *adj.* [Slang], = wacky.

**whale** (hwāl), *n.* نەهەنگ

*v.i.* ڕاوە نەهەنگ کردن: *( to go ~ing)* .

**a whale of**, [Colloq.], نموونەیەکی زۆر گەورە، باش، یا نایابی شتێك؛ زۆر زل: *( a whale of a tale, game, etc.; a whale of a difference)*

**whale** (hwāl), *v.t.* [Colloq.], لێدان؛ بیرازکردن؛ کوتان؛ تێهەڵدان.

**whaleback** (hwāl′bak′), *n.* پاپۆڕی باری قەموور؛ کەشتی هەڵمی پشت کووڕ

**whaleboat** (hwāl′bōt′), *n.* بەلەمی ڕاوە نەهەنگ: بەلەمێکی سەوڵی درێژو سەرو قنگ باریکە بە ئاسانی پێچی پێ دەکرێتەوە (بۆ ڕاوە نەهەنگ و وەك بەلەمی ڕزگاری سەر کەشتی بەکاردەهێنرێ). (هەروەها " whaler " ) .

**whalebone** (hwāl′bōn′), *n.* (١) ئێسقانی کاژێری سەرەوەی نەهەنگ. (هەروەها " baleen " ) .

(٢) شتێکی لەم ئێسقانە دروستکراو (بەتایبەتی کەمەربەند یا کۆرسیە)

**whaleman** (hwāl′mən), *n.* = whaler # 2.

**whaler** (hwāl′ẽr), *n.* (١) کەشتی ڕاوە نەهەنگ؛ بەلەمی ڕاوە نەهەنگ. (هەروەها " whaleboat " ) .

(٢) ڕاوچی نەهەنگ؛ ڕاوکەری نەهەنگ. (هەروەها " whaleman " ) .

**whale oil**, ڕۆنی نەهەنگ (لە لەبەی نەهەنگ دەگیرێت و سابوون و مۆم و ... هتد لێ دروست دەکرێ).

**whaling** (hwāl′iŋ), *n.* ڕاوە نەهەنگ.

**whaling** (hwāl′iŋ), *n.* [Colloq.], بیراز؛ کوتان؛ لێدانێکی چاك؛ تێهەڵدان.

**wham** (hwam), *n.* (١) زرمە لێ هەڵسان؛ پیادان بە دەنگێکی بەرز؛ شەقە لێ هەڵسان؛ تەقە. (٢) دەنگی بەیەکدادان؛ زرمە؛ شەقە؛ تەقە.

*v.t. & v.i.* شەقە لێ هەڵسان؛ زرمە لێ هەڵساندن: *( He ~med the door shut.)*

*adv.* لەپڕ: *( The car ran ~ up against the building.)* .

**whammy** (hwam′i), *n.* [Slang], چاو پیس؛ نوشتە لێکردن؛ جادوو لێکردن: *[ to put a ( or the ) whammy on someone ]* .

**whang** (hwaŋ), *n.* [Colloq.], (١) قایش؛ قەمچی.

(٢) (ا) قەمچی لێدان. (ب) دەنگی قەمچی لێدان.

*v.t.* (١) قەمچی لێدان؛ بە قەمچی لێدان.

(٢) لێدان؛ پیاکێشان؛ بە توند لێدان.

**whang** (hwaŋ), *v.t.* [Colloq.], زرمە لێ هەڵسان؛

به توند لێدان‌و دەنگدانەوە.
*v.i.* دەنگێکی گەورە لێ بوونەوە؛ دەنگدانەوە.
*n.* [Colloq.], دەنگدانەوەی زل؛ زرمە.
**whangee** (hwaŋ-ē′), *n.* (١) حەیزەران؛ قامیش.
(٢) دارحەیزەران؛ داردەست.
**whap** (hwop), *v.i.* [Dial. or Archaic], = **whop.**
**whapper** (hwop′ēr), *n.* [Colloq.], = **whopper.**
**wharf** (hwôrf), *n.* (١) ئەسکەلە؛ شۆستەی بەندەر (بۆ سوواربوون‌و بارکردن‌و داگرتنی کەشتی).
(٢) [Obs.]، گوێ ئاو؛ گوێ ڕووبار یا دەریا؛ کەنار ئاو.
*v.t.* (١) لەنگەر هاویشتن؛ کەشتی هێنانە لای شۆستەی بەندەرەوە.
(٢) باری کەشتی داگرتن؛ عەمارکردنی بارگەی کەشتی.
(٣) شۆستەی بەندەر بۆ کردن.
**wharfage** (hwôr′fij), *n.* (١) شۆستەی بەندەر بەکارهێنان (بۆ بارکردن‌و داگرتنی کەشتی‌و عەمارکردنی بارگەی کەشتی).
(٢) مزی ئەم شۆستە بەکارهێنانە.
(٣) شۆستەی بەندەر بەگشتی؛ ئەسکەلە بەگشتی؛ ئەسکەلەو دەزگای تری بەندەر بەگشتی.
**wharfinger** (hwôr′fin-jĕr), *n.* خاوەن یا کارگێڕی شۆستەی بەندەر.
**wharf rat,** (١) مشکەکوێرەی دەوروبەری ئەسکەلەو عەماری بەندەر.
(٢) کەسێکی دەربەدەری خوێڕی کە هاتوچۆی دەوروبەری ئەسکەلەو عەماری بەندەر دەکات‌و لەوێ دەژی.
**wharve** (hwôrv), *n.* چەرخە بچکۆلەی خەرەك.
**wharves** (hwôrvz), *n. alternative plural of* **wharf.**
**what** (hwut, hwät; *unstressed* hwət), *pron.* (١) (ا) چی؟
*( ~ is that thing?)*
(ب) چی؟ *( You told him ~ ?)* .
(ج) چی؟ *( ~'s life without her?)* .
(٢) (ا) ئەوەی؛ ئەوەی کە؛ چی: *( I know ~ you want.)* .
(ب) هەرچییەك؛ چی؛ هەرچی: *( Do ~ you will.)* .
(ج) کە: *( There's no one but ~ would approve this act.)* .
(٣) چەند: *( W~ did the shirt cost?)* .
*adj.* (١) کام؛ چی
*( W~ man told you that? I know ~ books you need.)*
(٢) ئەوەندەی؛ ئەوەی؛ چی: *( Take ~ time you need.)* .
(٣) ئای چەند جێی سەرسامییە! (لەبەر باشی، خراپی، گەورەیی... هتد):
*( ~ a man! ~ an idea! ~ nonsense! )*
*adv.* (١) چۆن؛ تا چی ڕادەیەك؛ لە چی ڕوویەکەوە؛ چی:
*( ~ does it help to complain?)*
(٢) تا ڕادەیەك؛ ئەختێك:
*( ~ with singing and joking the time passed quickly.)*
(٣) ئای چەند خۆشە، ناخۆشە، باشە، خراپە، یا وەهایە... هتد:
*( ~ tragic news!)*
(٤) [Obs.]، بۆچی؛ بۆ.
*conj.* (١) کە *( Never doubt but ~ he loves you.)* .
(٢) [Dial.]، ئەوەندەی کە؛ ئەوەندەی:
*( We warned him ~ we could.)*
*interj.* ووتەیەکە بۆ سەرسامی، تووڕەیی... هتد بەکاردێت:
*( ~ ! no dinner?)*
**and what not,** وە گەلێك شتی تر؛ هتد؛ وە هەروەها.
**what for,** (١) بۆ؛ بۆچی؛ بۆ چی مەبەستێك؛ لەبەرچی.
(٢) [Slang]، سزا؛ قەمچی لێدان؛ دارکاری:
*( I'll give him what for!)*
**what have you,** [Colloq.], وە شتی تریش
*( He sells games, toys, or what have you.)*
**what if,** گریمان؛ وا دانێ.
**what's what,** [Colloq.], ڕاستی شتێك یا باروودۆخێك؛ ڕاست‌و درۆی شتێك: *( He doesn't know what's what.)* .
**whate'er** (hwət-er′), *pron. & adj.* [Poetic], = **whatever.**
**whatever** (hwət-ev′ēr), *pron.* (١) هەرچییەك؛ هەرچی؛ چی؛ هەرشتێك: *( Do ~ you please.)* .
(٢) ئەوەی کە؛ هەرچییەك کە؛ هەرشتێك؛ چی:
*( ~ is left over is yours.)*
(٣) هەرچۆنێك بێ؛ هەرشتێك بێ؛ گرنگ نییە چی بێ:
*( ~ you may think, he's innocent.)*
(٤) [Colloq.]، چی؟ (پرسیاری سەرسامی):
*( ~ does he mean by that? ~ happened to her? )*
*adj.* (١) هەر (شت، ژمارە، چۆنێتی... هتد)؛ هەرچی؛ هەرشتێك:
*( He can make ~ repairs are needed.)*
(٢) هەموو؛ هەمووی؛ هەرچی:
*( He applied ~ strength he had left to the task.)*
(٣) هیچ: *( I have no pains ~ .)* .
**whatnot** (hwut′not′, hwät′not′), *n.* (١) (وە) نازانم چی؛ (وە) شتی تر؛ هتد: *( spoons, forks, napkins, plates, and ~ .)*
(٢) دۆلابێکی کراوەیە ووردە شتی ئەنتیکەو جوان لەسەر ڕەفەکانی دادەنرێ.
**what's** (hwuts, hwäts; *unstressed* hwəts), = **what is.**
**whatsoe'er** (hwut′sō-er′), *pron. & adj.* [Poetic], = **whatsoever.**
**whatsoever** (hwut′sō-ev′ēr), *pron. & adj.* = **whatever.**
**wheal** (hwēl), *n.* زیپکە؛ پیزۆکە؛ قنچکە؛ دوومەڵ؛ تامیسك.
**wheal** (hwēl), *n.* جێ نیشانی قەمچی‌و دار لێدان بە پێستەوە. (هەروەها " **wale** " ).
**wheat** (hwēt), *n.* گەنم.
**wheatear** (hwēt′êr′), *n.* قنگ سپیلکە: باڵندەیەکی کۆچکەری بۆری بچووك‌و لاق درێژە.
**wheaten** (hwēt′'n), *adj.* (١) گەنمی؛ لە گەنم یا ئاردی گەنم درووستکراو. (٢) گەنم ڕەنگ.
**wheat rust,** ژەنگی گەنم.
**wheat worm,** کرمی گەنم: کرمێکی خڕی بچووکە گەنم دەفەوتێنێ.
**whee** (hwē), *interj.* قریوەی خۆشی دەربڕینە.
**wheedle** (hwē′d'l), *v.t. & v.i.* (١) خۆبردنەپێشەوە؛ ماستاوکردن؛ مەرایی کردن. (٢) بە مەرایی دەسکەوتن: *( She ~d a gift from him.)* .
**wheel** (hwēl), *n.* (١) چەرخ؛ ڕەوڕەوە؛ پێچکە.
(٢) چەرخی ئاگربازی: چەرخێکە دەسووتێ لە کاتی سوڕانەوەدا.
(٣) ئامێری چەرخی: (ا) چەرخی ئازاردان (لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەکاردەهێنرا). (ب) سووکان یا ستێرنی کەشتی.
(ج) **steering wheel** .
(د) [Colloq.]، پاسکیل.
(ه) **spinning wheel** . (و) **potter's wheel** .
(٤) (*pl.*)، ڕەوڕەوە؛ هێزو دەزگاو هۆی پاڵنەر: *( the ~s of progress)*
(٥) وەرگەڕان؛ سوڕانەوە (ڕیزی لەشکر)؛ وەرچەرخان.
(٦) بەشی بۆ سەندنەوەی گۆرانی.
*v.t.* (١) (ا) لێخوڕین؛ ئاژوتن؛ خل کردنەوە:
*( He ~ed the cart into the yard.)*
(ب) گواستنەوە بە ئوتومبیل یا شتی ڕەوڕەوەدار.
(٢) خولاندنەوە؛ سوڕاندنەوە.
(٣) پێچکە بۆ کردن.
*v.i.* (١) خولانەوە؛ سوڕانەوە.
(٢) ( **about** ~ )، وەرچەرخان (ڕێڕەو، بیروڕا، هەڵوێست)؛ وەرگەڕان.
(٣) وەرچەرخان‌و شاڵاوبردن (باڵندە).

(٤) لەسەر ڕەوڕەوە ڕۆیشتن؛ خل بوونەوە.

**at ( or behind ) the wheel,** (١) لێی دەخوڕێ (ئوتومبیل، کەشتی)؛ ستێرن یا سوکانی بە دەستەوەیە.

(٢) بەرپرسیارە؛ سەرەوکاری دەکات؛ هەمووشتێکی بە دەستە.

**wheel of fortune,** (١) چەرخی فەلەك؛ چەرخی ڕۆژگار.

(٢) بێ باری ڕۆژگار؛ هەڵبەزودابەزی ڕۆژگار؛ بهاتو نەهاتی ژیان.

**wheels within wheels,** زنجیرە ڕووداوێکی پێکەوە بەستراو.

**wheel and deal,** [Colloq.], سەوداگەری کردن (لەڕووی خراپەوە)؛ پیلان گێڕان بۆ سوودو پێشکەوتنی خۆ (بازرگانی، ڕامیاری... هتد)؛ قوماربازی کردن.

**wheel-barrow** (hwēl′bar´ō), *n.* عەرەبانەی دەستی؛ عەرەبانەی خۆڵ؛ یەك چەرخە.

*v.t.* بە عەرەبانەی دەستی گوێزانەوە

**wheelbase** (hwēl′bās´), *n.* دووری نێوان پێچکەی پێشەوەو دواوەی ئوتومبیل بە ئینچ

**wheel-chair** (hwēl′châr´), *n. Also* **wheel chair,** کورسی پێچکەدار (بۆ نەخۆش)؛ کورسی پەککەوتە

**wheeled** (hwēld), *adj.* پێچکەدار؛ ڕەوڕەوەدار؛ ئەوەندە پێچکەی هەیە: *(four- ~ )*

**wheeler** (hwēl′ēr), *n.* (١) لێخوڕ؛ ڕانەر (٢) **wheel horse** .

(٣) شتی پێچکەدار؛ ئەوەندە پێچکەی هەیە:

*( a four- ~ ; a three- ~ ; a two- ~ )*

**wheeler-dealer** (hwēl′ēr-dēl′ēr), *n.* [Colloq.], قومارباز؛ سەوداگەری زۆرزان یا شەیتان

**wheel horse,** (١) ئەسپی ڕەوڕەوە ئەو ئەسپەی لە هەموو ئەوانەی تر نزیکترە لە پێچکەی پێشەوە لە گالیسکەی چەند ئەسپیدا.

(٢) کەسێکی زۆر ئیشکەر؛ کەسێکی زۆر کۆششکەر (بەتایبەتی لە حیزب یا ڕێکخراوێکدا). (هەروەها " **wheeler** ").

**wheel-house** (hwēl′hous´), *n.* = **pilot-house.**

**wheeling** (hwēl′iŋ), *n.* (١) پاسکیل لێخوڕین؛ بە پاسکیل چوون.

(٢) خول؛ سوڕ. (٣) باش و خراپی ڕێگە (بۆ پاسکیل و ئوتومبیل... هتد).

**wheel lock,** = **gunlock.**

**wheelman** (hwēl′mən), *n.* (١) **helmsman** . (٢) **cyclist** .

**wheelsman** (hwēlz′mən), *n.* **helmsman.**

**wheelwork** (hwēl′wûrk´), *n.* چەرخ یا گێرەکانی مەکینەیەك.

**wheelwright** (hwēl′rīt′), *n.* چەرخچی؛ چەرخساز.

**wheen** (hwēn), *n.* [Scot. & Eng. Dial.], ژمارەیەکی کەم؛ چەند؛ بڕ؛ هەند

**wheeze** (hwēz), *v.i. & v.t.* خیزەخیزی سنگ هاتن

*n.* (١) خیزە؛ خیزەی سنگ؛ خیزەخیز.

(٢) [Colloq.]. نوکتەیەکی کۆن و پەڕپووت.

**wheezy** (hwēz′i), *adj.* خیزەخیزکەر؛ خیزەدار: *( a ~ chest, sound, etc.)*

-**wheezily** *(adv.)*; **wheeziness** *(n.).*

**whelk** (hwelk), *n.* گیاندارێکی بچووکی قاقلەداری ئاوییە دەخورێت؛ قاقلەجنۆکەی ئاوی.

**whelk** (hwelk), *n.* = **wheal.**

**whelm** (hwelm), *v.t.* (١) بە ئاو داپۆشین؛ کردن بە ژێر ئاوەوە؛ هەمووگرتنەوە بە ئاو؛ نوقوم کردن. (٢) **overwhelm** .

**whelp** (hwelp), *n.* (١) توونکە سەگ؛ بەچکە سەگ؛ توولە؛ تووتك.

(٢) بەچکە (شێر، پڵنگ، وورچ، گورگ... هتد).

(٣) (ا) مندان؛ لاو (ب) مندالی چەقاوەسوو؛ کوڕی بێ حەیا

(٤) ددانی چەرخی داندار (وەك هی پاسکیل).

*v.t. & v.i.* ترەکین؛ زایین (بۆ ژن لەڕووی سووکییەوە)

**when** (hwen; *unstressed, often* hwən), *adv.* کەی؟؛ چ کاتێ؟: *( ~ did that happen?)* .

*conj.* (١) کەی؛ چ کاتێ: *( He told us ~ to eat.)* .

(٢) کاتێك کە؛ لەو کاتەدا کە:

*( She came at six, ~ the sun was setting.)*

(٣) کە؛ ئەو کاتەیە کە: *( Now is the time ~ we must speak out.)* .

(٤) کاتێك کە؛ کاتێك: *( ~ we were college students)* .

(٥) کوتوپڕ کە؛ هەر کە؛ کە: *( We will eat ~ the guests arrive.)* .

(٦) هەرکاتێك؛ کە: *( Babies cry ~ they are hungry.)* .

(٧) ئەگەرچی:

*( He's reading a book ~ he might be out playing.)*

(٨) ئەگەر: *( How can we finish on time, ~ you won't help?)* .

*pron.* کەی: *( Since ~ has this been going on?)* .

*n.* کات (ی ڕووداوێك): *( I know the ~ and where of his arrest.)* .

**whenas** (hwen-az′), *conj.* (١) **when** . (٢) **whereas** .

**whence** (hwens), *adv.* (١) لە کوێوە: *( ~ do you come? I know ~ he comes.)*

(٢) لە کوێ؛ لە چ سەرچاوەیەکەوە؛ لە کوێوە: *( W~ does he get his strength?)*

(٣) بۆ ئەو شوێنەی کە: *( Return ~ you came.)* .

*conj.* لەبەرئەوە؛ بۆ ئەوە.

**whencesoever** (hwens´sō-ev′ēr), *adv. & conj.* لە هەر شوێنێکەوە؛ لە هەر کوێیەکەوە.

**whene'er** (hwen-er′), *adv. & conj.* [Colloq.], = **whenever.**

**whenever** (hwen-ev′ēr, hwən-ev′ēr), *adv.* (١) هەرکاتێك.

(٢) کەی؟ (سەرسامی دەردەبڕێ): *( ~ will you learn?)* .

(هەروەها " **when ever** " بەم مانایە) .

*conj.* (١) هەرکاتێك کە؛ کە؛ هەرکاتێك: *( We can leave ~ you're ready.)*

(٢) هەر کە؛ هەموو کاتێك کە؛ هەرکاتێك: *( Visit us ~ you can.)*

**whensoever** (hwen´sō-ev′ēr), *adv. & conj.* = **whenever.**

**where** (hwâr), *adv.* (١) لە کوێ؟؛ کوا؟؛ کوانێ؟: *( ~ is my hat?)* .

(٢) بۆ کوێ؟: *( ~ did she go?)* .

(٣) لە چ بارودۆخێکدا؟: *( ~ will we be if we lose?)* .

(٤) چۆن؟؛ لە چ ڕوویەکەوە؟: *( ~ do I come into the matter?)* .

(٥) لە کوێوە؟؛ لە چ شوێنێکەوە؟؛ لە کوێ؟: *( W~ do you get your information?)*

*conj.* (١) لە کوێ؛ لە چ شوێنێك: *( I know ~ they are.)* .

(٢) لەوێدا؛ لەو شوێن یا بارودۆخەدا کە: *( I am ~ I should be.)* .

(٣) لە هەرکوێیەکدا کە؛ لە هەرشوێنێکدا کە؛ لەو شوێنەی کە:

*( There is never peace ~ men are greedy.)*

(٤) بۆ ئەو شوێنەی کە: *( I will take you ~ you are going.)* .

*pron.* (١) ئەو شوێنەی کە: *( I live far from ~ I was born.)* .

(٢) لە کوێوە؟: *( W~ do you come from?)* .

*n.* شوێن (ی ڕووداوێك): *( I don't know the when and ~ of the accident.)*

**whereabout** (hwâr′ə-bout´), *adv. & n.* [Rare], = **whereabouts.**

**whereabouts** (hwâr′ə-bouts´), *adv.* لە کوێ؟؛ لە چ ناوچەیەك؟؛ لە نزیك کوێوە؟: *( ~ do you live?)* .

*n.* سەروشوێن: *( Do you know her ~ ?)* .

**whereas** (hwâr-az′), *conj.* (١) لەبەر؛ بەهۆی؛ بەهۆی ئەوەوە کە؛ لەبەرئەوەی کە: *( ~ the following incidents have occurred.)*

(٢) کەچی؛ بەڵام؛ لەکاتێکدا؛ بە پێچەوانەوەی ئەوەوە:

*( Some people love snow, ~ others hate it.)*

**whereat** (hwâr-at′), *adv.* [Rare or Archaic], لە چی؟

*( ~ did he get so angry?)*
*conj.* لەسەر ئەوە؛ ئەوسا؛ ئەو کاتە:
*( He turned to leave, ~ she began to weep.)*
**whereby** (hwâr′bī′), *adv.* (١) بە چیدا؟ چۆن؟:
*( ~ shall we know him?)*
(٢) کە بە هۆیەوە؛ کە پێی؛ کە لە ڕێی ئەو شتەوە:
*( a device ~ to make money)*
**where'er** (hwâr-er′), *adv. & conj.* [Poetic], = wherever.
**wherefore** (hwâr′fôr′, hwâr′fōr′), *adv.* (١) بۆ؟ بۆچی؟
لەبەرچی؟ *( ~ did you go?)*.
(٢) بۆ ئەوە؛ کە بۆی: *( the reason ~ we have met.)*.
*conj.* لەبەرئەوە؛ بۆیە
*( We ran out of water, ~ we surrendered.)*
*n.* هۆ: *( Never mind the why and ~ .)*.
**wherefrom** (hwâr-frum′, hwâr-from′), *adv.* لە کوێوە؟
لەوێوە کە
**wherein** (hwâr-in′), *adv.* (١) لە چیدا؟ *( ~ was I wrong?)*.
(٢) کە تێیدا: *( the room ~ he slept)*.
**whereinto** (hwâr-in′too, hwâr′in-too′), *adv.* بۆ ناو چی؟
بۆ ناو کوێ؟ بۆ ناو ئەو شوێنەی.
**whereof** (hwâr-uv′, hwâr-ov′), *adv.* (١) (ا) لە بابەت چییەوە؟
دەربارەی چی؟ (ب) دەربارەی ئەوەی کە.
(٢) (ا) لە بابەت کێوە؟ دەربارەی کێ؟ (ب) هی ئەو کەسەی کە.
**whereon** (hwâr-on′), *adv.* (١) لەسەر چی؟ *( ~ do you rely?)*.
(٢) ئەوەی کە لە سەری: *( the hill ~ we stand.)*.
**wheresoe'er** (hwâr′sō-er′), *adv. & conj.* [Poetic].
**wheresoever.**
**wheresoever** (hwâr′sō-ev′ẽr), *adv. & conj.* = wherever.
**wherethrough** (hwâr-throo′), *adv.* [Rare], کە بە هۆیەوە؛
ئەوەی کە بە ناویدا؛ لەو کاتەدا کە.
**whereto** (hwâr-too′), *adv.* (١) بۆ کوێ؟ بۆ چ شوێنێک؟ بۆچی؟
بۆ چی مەبەستێک؟ (٢) بۆ ئەو شتەی کە؛ بۆ ئەوەی کە.
**whereunto** (hwâr′ən-too′), *adv.* [Archaic], whereto.
**whereupon** (hwâr′ə-pon′), *adv.* لەسەر کوێ؟ لەسەر چی؟
لەسەر ئەو شوێنەی کە
*conj.* ئیتر؛ لەوەوە؛ بەو هۆیەوە؛ لە ئەنجامی ئەوەدا؛ ئەوسا:
*( I explained the matter, ~ he laughed heartily.)*
**wherever** (hwâr-ev′ẽr), *adv.* (١) لە هەر کوێ؛ لە هەر کوێیەک؛
لە هەر شوێنێک (٢) لە کوێ؟ (لەڕووی سەرسامییەوە):
*( ~ did you hear that?)*
(هەروەها " where ever " بەم مانایە).
*conj.* لە هەر کوێ؛ لە هەر کوێیەک؛ لە هەر شوێن؛ لە هەر بارودۆخێکدا.
**wherewith** (hwâr-with′), *adv.* [Archaic], (١) بە چی؟:
*( ~ shall I save him?)*
(٢) بەوەی کە؛ کە پێی *( the fingers of this hand ~ I write.)*
*pron.* ئەوەی کە پێی؛ ئەو شتەی کە پێی.
**wherewithal** (hwâr′with-ôl′), *n.* هۆی پێ کردنی کارێک
(بەتایبەتی پارە)؛ پارە؛ ئەوەی پێویستە بۆ جێبەجێکردنی شتێک:
*( I haven't the ~ to continue my education.;*
*to have the ~ for war)*
*adv. & conj.* [Archaic]. = **wherewith.**
**wherry** (hwer′i), *n.* (١) بەلەمی سەوڵی بچووک.
(٢) بەلەمی سەوڵی یەک کەسی پێشبڕکێ
(٣) [British]. بەلەمی بار.
*v.t.* بە بەلەمی بار گواستنەوە

**whet** (hwet), *v.t.* (١) تیژکردن بە هەسان (چەقۆ یا تیغی تر)؛ تیژکردنەوە.
(٢) بزواندن؛ جووڵاندن (ئارەزوو، هەوەس)؛ ئارەزووکردنەوە؛ چەژکردن؛
هەوەس هەڵساندن: *( to ~ one's appetite)*.
*n.* (١) تیژکردن؛ تیژکردنەوە. (٢) تیژکەرەوە.
(٣) [Colloq.]، ئارەزووکەرەوە (خواردەمەنی، خواردنەوە)؛ پێک
**whether** (hweth′ẽr), *conj.* (١) ئەگەر؛ ئەگەر وا بێ.
*( He asked ~ I would help.)*
(٢) چ وا بێ... چ وا؛ چ ئەو بێ... چ ئەو؛ ئەگەر... ئەگەر؛ ئەگەر
| ~ *he drives or ( ~ he ) takes the train, he will be on time.*
*I don't know ~ he'll improve.* |
(٣) ئایا:
*( He was completely ignored ~ by accident or design.)*
*pron.* [Archaic], کامیان
whether or no, هەر چۆنێک بێ؛ بە هەر حاڵ.
**whetstone** (hwet′stōn′), *n.* هەسان؛ زبرە؛ بەردە زبرە
**whew** (hwū), *interj.* ووتەیەکە سەرسامی، بێزاری، ترس، یا
ئۆخەی... هتد دەردەبڕێ.
**whey** (hwā), *n.* پەنیراو؛ ئاوی پەنیر؛ ئەو ئاوەیە کە لە ماست
جیا دەبێتەوە لە کاتی پەنیر لێ دروستکردندا
**wheyey** (hwā′i), *adj.* لە پەنیراو دەچێ؛ تایبەتی بە ئاوی پەنیر.
**whey-face** (hwā′fās′), *n.* (١) دەموچاوی سپی هەڵگەڕاو؛
ڕەنگ هەڵبزرکاو. (٢) کەسێکی دەموچاو سپی هەڵگەڕاو (لە ترسدا)؛
کەسێکی ڕەنگ بزرکاو یا هەڵگەڕاو
**whey-faced** (hwā′fāst′), *adj.* سپی هەڵگەڕاو (لە ترسدا)؛
ڕەنگ بزرکاو یا هەڵگەڕاو
**which** (hwich), *pron.* (١) کام؟ کامە؟ کامەیان؟:
*( ~ of the men answered? ~ do you want?)*
(٢) ئەوەی کە؛ کامە؛ کامەیان: *( I know ~ you want.)*.
(٣) کە (بۆ گیاندارو شتومەک):
*( My hat, ~ is on the table; the war ~ has just ended.)*
(٤) چ؛ هەر کامێکیان؛ هەر کامیان؛ ئەوەی:
*( You may take ~ you prefer.)*
*adj.* (١) کام؟ کامیان؟ کامە؟ چ؟: *( ~ books shall I choose?)*.
(٢) هەرچی؛ چ:
*( Try ~ method you please, you cannot succeed.)*
**whichever** (hwich-ev′ẽr), *pron. & adj.* (١) هەر کامیان:
هەر کامێکیان؛ هەر کام: *( You may choose ~ desk you wish.)*.
(٢) گرنگ نییە هەر کامیان بێ؛ هەر کامیان:
*( It is a long trip ~ road you take.)*
**whichsoever** (hwich′sō-ev′ẽr), *pron. & adj.*
whichever.
**whidah** (hwid′ə), *n. Also* whidah bird, whidah finch,
whydah, باڵندەیەکی بچووکی ڕەشی ئەفەریقییە هێلانەکەی لە پووش و
چیلکە دروست دەکات. نێرەکەی کلکێکی زۆر درێژی پێوەیە.
**whiff** (hwif), *n.* (١) سروە؛ سوزە؛ شنە *( a ~ of cool air)*.
(٢) بۆنێکی کەم (خۆش یا ناخۆش) *( a ~ of garlic, onion, jasmin)*
(٣) مژ (هەوا، جگەرە، سەبیل)؛ فوو: *( Take a ~ of this pipe.)*
(٤) دووکەڵ (جگەرە)؛ هاڵاو
(٥) هەڵچوون؛ تووڕەیی: *( a ~ of temper)*.
*v.t.* (١) فوولێکردن؛ فوو پێداکردن. (٢) بەبادان (دووکەڵی جگەرە یا سەبیل).
(٣) کێشان (سەبیل، جگەرە)؛ مژلێدان.
*v.i.* (١) هەڵکردن (سروە): *( The wind ~ed through the trees.)*.
(٢) مژلێدان و دووکەڵ بەبادان؛ مژلێدان.
**whiffet** (hwif′it), *n.* (١) فوویەکی بچووک؛ مژێکی بچووک؛
سروەیەکی کەم (٢) سەگێکی بچووک.

(٣) کەسێکی بچووک و هیچ‌وپووچ؛ منداڵ.

**whiffle** (hwif′'l), *v.i.* (١) هەڵکردن بە پچرپچری (با) .

(٢) ڕاڕایی کردن؛ دوودڵی کردن. (٣) فیکەلێدان؛ فیکەکێشان.

***v.t.*** بە فوو بڵاوکردنەوە؛ فوولێکردن (بۆ بڵاوکردنەوە)؛ پەرش‌وبڵاوکردنەوە (با).

**whiffler** (hwif′lēr), *n.* ڕاڕا؛ دوودڵ.

**whiffle-tree** (hwif′'l-trē′), *n.* مژان (هەوجار، گالیسکە)؛ داری مژان. (هەروەها " singletree " ، " swingletree " ، " whippletree " ).

**Whig** (hwig), *n.* (١) حیزبی دیموکراسی و پێشکەوتنخوازی کۆنی ئینگلتەرە کە لە دواییدا بوو بە " حیزبی ئازادیخوازان " .

(٢) لایەنگری شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمەریکا دژ بە ئینگلیز.

(٣) حیزبێکی کۆنی ئەمەریکی بوو کە دژی دەسەڵاتی لە ئەندازە بەدەری میری بوو وە لە دواییدا بوو بە " حیزبی کۆماری " .

*adj.* تایبەتی بە " Whig " .

-Whiggish *(adj.).*

**Whiggery** (hwig′ēr-i), *n. Also* Whiggism. بیروڕاو ڕێبازی " Whig " ەکان (وشەی پێشوو ببینە).

**while** (hwīl), *n.* (١) ماوە؛ سەردەم؛ تاو.

*( a short ~ ; Stay for a ~ : to wait a long ~ )*

(٢) کات و ئەرک و پارەی پێویست بۆ کردنی شتێك.

*( Is this conference worth your ~ ?)*

*conj.* (١) لە کاتێکدا؛ هەتا؛ بە درێژایی ئەو کاتە کە:

*( It was lovely ~ it lasted.)*

(٢) (ا) لە هەمان کاتدا؛ ئەگەرچی؛ هەرچی چەند:

*( W~ he was no poor, he had no ready cash.)*

(ب) کەچی؛ بەڵام؛ وە:

*( The walls are green, ~ the ceiling is white.)*

(٣) [Dial.]. هەتا؛ هەتاکو.

***v.t.*** ( ~ away ), بردنە سەر بە خۆشی؛ کات کوشتن:

*( We ~d away the afternoon.)*

all the while, بە درێژایی ئەو کاتە کە.

between whiles, جاربەجار؛ جارجار؛ ناوبەناو.

once in a while, جاربەجار؛ جارجار؛ جارنەجار؛ ناوبەناو.

worth one's while, دەهێنێ؛ بەسوودە؛ ئەو کات و ئەرك و پارەیە دەهێنێ کە تێی دەچێ: *( Having a child is worth your while.)*

**whiles** (hwīlz), *adv.* [Archaic or Dial.]. هەندێ جار.

*conj.* [Archaic]. = while.

**whilom** (hwī′ləm), *adv.* [Archaic]. لەوەوپێش؛ پێشوو؛ ڕابوردوو.

*adj.* [Archaic]. پێشوو: *( their ~ friends)* .

**whilst** (hwīlst), *conj.* [Chiefly British]. = while.

**whim** (hwim), *n.* (١) ئارەزووی کاتی؛ هەوەس؛ حەزی سەردەمی.

(٢) جەنجەری ئاو و کانزا (ئەسپی پێوە دەبەستریٙ و ئاو و کانزای پێ هەڵدەهێنجری).

**whimbrel** (hwim′brəl), *n.* باڵندەیەکی کەنار ئاوی ئەورووپاییە.

**whimper** (hwim′pēr), *v.i. & v.t.* نووزاندن؛ نووزەنووزکردن؛ کرووزانەوە؛ فنکەفنك کردن؛ گریان لەژێر لێوەوە: *( The child ~s. )*

*n.* نووزە؛ کرووزانەوە؛ فنکەفنك.

*( Life ends not with a bang but with a ~ .)*

-whimperer *(n.)*; whimperingly *(adv.).*

**whimsical** (hwim′zi-k'l), *adj.* (١) هەوەسباز؛ حولحول؛ ئارەزووباز؛ شێتەوژیرە. (٢) سەیر؛ نائاسا.

-whimsically *(adv.).*

**whimsicality** (hwim′zi-kal′ə-ti), *n.* (١) هەوەسبازی؛ حولحولێتی؛ ئارەزووکاری. (٢) کردەوەی هەوەسبازیانە؛ ڕەفتاری حولحولییانە.

**whimsy, whimsey** (hwim′zi), *n.* (١) whim .

(٢) شتی سەیرو نائاسا.

**whin** (hwin), *n.* دەوەنێکی هەمیشە سەوزی درکاوی چۆڵەوانییەکانە گوڵی زەرد دەگرێ. (هەروەها " furze " ، " gorse " ).

-whinny *(n.).*

**whin** (hwin), *n.* = whinstone.

**whinchat** (hwin′chat′), *n.* باڵندەیەکی قاوەیی دەنگ خۆشی دەشتەکانە.

**whine** (hwīn), *v.i.* (١) نووزەنووزکردن؛ نووزانەوە؛ کرووزانەوە؛ بۆڵەبۆڵ کردن؛ قرووسکان:

*( The child ~s all the time. Why are you ~ing?)*

(٢) سکاڵاکردن بە نووزەنووز و کرووزانەوە؛ کورکاندن؛ کورکەکورك کردن.

(٣) ناڵاندن (مەکینە)؛ فنگەفنگ کردن؛ لووراندن؛ نکاندن:

*( The engine ~d as we were driving uphill.)*

*v.t.* نووزانەوە؛ بە نووزەنووز داواکردن یا دەربڕین؛ کورکاندن.

*n.* (١) نووزانەوە؛ کرووزانەوە؛ کورکەکورك کردن؛ قرووسکانەوە.

(٢) نووزەنووز؛ کرووزەکرووز؛ کورکەکورك؛ قرووسکەقرووسك.

(٣) سکاڵای بە نووزانەوە یا کرووزانەوە کراو.

-whiner *(n.)*; whiningly *(adv.).*

**whinny** (hwin′i), *v.i.* حیلاندن؛ لووشکاندن؛ لووشکەلووشك کردن؛ کورکاندن.

*v.t.* بە حیلە یا لووشکەلووشك دەربڕین.

*n.* حیلە؛ حیلەحیل؛ لووشکە؛ لووشکەلووشك؛ کورکە؛ کورکەکورك.

**whinstone** (hwin′stōn′), *n.* مەرمەڕی ڕەش؛ جۆرە بەردێکی سەختی قورسی ڕەشە لە کۆمەڵەی " بازۆڵت " . (هەروەها " whin " ، " trap " ).

**whiny** (hwīn′i), *adj.* نووزەنووزکەر؛ بە نووزە: *( a ~ child, dog)* .

**whip** (hwip), *v.t.* (١) ( ~ out; ~ off; ~ up )، لەپڕ ڕاتەکاندن، دەرهێنان، ڕاکێشان، لە دەست هەڵپڕووسکان، یا لادان:

*( He ~ped out a knife.)*

(٢) (ا) لێدان بە قەمچی یا دار؛ دارکاری کردن؛ قەمچی لێدان.

(ب) سزادان بەم شێوەیە.

(٣) ( ~ up )، وورووژاندن؛ هاندان؛ پاڵ پێوەنان:

*( to ~ up an emotion, the crowd, etc.)*

(٤) پیادان؛ پیاماڵین بە توند؛ داگرتنەوە: *( The rain ~ped her face.)*

(٥) بە توند سەرزەنشتکردن؛ پێ ووتن؛ هێرش بردنە سەر.

(٦) داگرتنەوەی پەت یا گوریسێك بە بەن تێوەئاڵاندن بۆ ئەوەی هەڵنەوەشێ.

(٧) پەراوێز داگرتنەوە؛ قەراغ یا شیرازە هەڵپێچان.

(٨) ڕاوەماسی کردن (بە پەیتاپەیتا قولاپ هەڵدان).

(٩) شڵەقاندن و کەف لێ هەڵساندن (هێلکە ... هتد).

(١٠) [Colloq.]، بۆرپێدان؛ بەزاندن؛ لێ بردنەوە.

(١١) بەرزکردنەوە بە خولخولۆکە.

(١٢) ( ~ up )، بە پەلە نووسین یا کردن... هتد:

*( to ~ up a story, poem, sketch, etc.)*

*v.i.* (١) بە پەلە ڕۆیشتن یا چوون؛ دەرپەڕین؛ لەپڕ تێ تەقان؛ ڕاکردن:

*( He ~ped down the stairs.)*

(٢) شەکانەوە بە قایم: *( Flags ~ in high wind.)* .

(٣) هەڵدان (قولاپی ڕاوەماسی)؛ هاویشتن.

*n.* (١) قەمچی؛ قامچی؛ شەلاق؛ شەلاخ. (٢) قەمچی لێدان.

(٣) قەمچی وەشێن: (ا) عەرەبانچی؛ گالیسکەچی.

(ب) ڕاوچییەکە کە بە قەمچی لە تانجی و سەگەکان دەدات.

(٤) (ا) قەمچی بە دەست: ئەندامێکی بەرزی حیزبێکی کۆنگرێسی ئەمەریکی یا پەرلەمانێکە کە بەرپرسیاری ئامادەبوونی ئەندامەکان و جێبەجێکردنی کاروبارو بەرنامەی حیزبەکەیەتی. (هەروەها " party whip " ).

(ب) بانگ کردنی ئەندامانی حیزبێکی کۆنگرێس یا پەرلەمان بۆ کۆبوونەوە.

(٥) دەست جووڵانێکە وەك قەمچی وەشان؛ قەمچی وەشان.

(٦) جۆرە شیرینییەکە.

(٧) پەتی خولخولۆکەی بەرزکردنەوە (کەشتیوانی).

whip in, گردکردنەوە بۆ کۆرگرتن.
whip up, (١) وورووژاندن. هاندان؛ هێنانە جۆش:
*( to whip up a crowd)*
(٢) [Colloq.]، بە پەلە لێنان یا ئامادەکردن؛ بە پەلە نووسین یا کردن:
*( to whip up a meal; to whip up a story, sketch, etc.)*

**whipcord** (hwip′kôrd′), *n.* (١) قایشی قەمچی؛ قایشێکی قایمی بادراو یا هۆنراوەیە بۆ قەمچی بەکاردەهێنرێ.
(٢) ژێ (کە لە ڕیخۆڵەی مەڕو ئەسپ دروست دەکرێ بۆ ئامێری مۆسیقیو... هتد). (٣) جۆرە قوماشێکە.

**whip hand,** (١) دەستی قەمچی: ئەو دەستەی کە سوار یا عەرەبانچی قەمچی پێ دەگرێت. (٢) دەسەڵات؛ ژووردەستی؛ دەست ڕۆیشتن؛ ڕکێف:
*( He has the ~ in this situation.)*

**whip-lash** (hwip′lash′), *n.* (١) قایشی قەمچی.
(٢) ئازار پێگەیشتنی بڕبڕەو مل بەهۆی لەپڕ سەر ڕاتەکانەوە (وەك چۆن ئەگەر یەکێك لە ئۆتومبیلێکدا بێ و لە دواوە ئۆتومبیلێکی تر لێی بدات):
*( He got a ~ when his car was struck from behind.)*
(هەروەها پێشی دەووترێ: " whiplash injury ").

**whipper** (hwip′ēr), *n.* قەمچی وەشێن.

**whipper-in** (hwip′ēr-in′), *n.* (١) [Chiefly British]، - یاریدەدەری ڕاوچی کە بە قەمچی سەگو تانجییەکان دابین دەکات.
(٢) whip # 4-A

**whipper-snapper** (hwip′ēr-snap′ēr), *n.* کەسێکی هیچ‌وپووچی خۆدەرخەر (بەتایبەتی گەنج).

**whippet** (hwip′it), *n.* (١) سەگێکی تیژڕەوە لە تانجی دەکات (بۆ پێشبڕکێ بەکاردەهێنرێ)؛ تانجی. (٢) دەبابەیەکی بچووکە لە شەڕی جیهانیی دووەمدا لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە بەکاردەهێنرا.

**whipping** (hwip′iŋ), *n.* (١) قەمچی لێدان؛ قەمچیکاری؛ جەڵدە لێدان. (٢) بەنی پەراوێز پێ داگرتنەوە؛ تاڵە بەنی شیرازە پێ هەڵپێچان.

**whipping boy,** (١) قۆچی قوربانی: منداڵێکە کە لەگەڵ شازادەیەکدا پێی دەخوێنراو لەباتی ئەو سزا دەدرا. (٢) scapegoat # 2.

**whipping post,** کۆڵەکەی قەمچی لێدان: کۆڵەکەیەکە خەڵکی تاوانباری پێوە دەبەسترێتەوەو جەڵدەیان لێ دەدرێت.

**whipple-tree** (hwip′'l-trē′), *n.* = **wiffle-tree.**

**whip-poor-will** (hwip′ēr-wil′), *n.* باڵندەیەکی قاوەیی شەوگەڕە ناوەکەی لە دەنگی خوێندنەکەیەوە وەرگیراوە.

**whip-saw** (hwip′sô′), *n.* مشارێکی باریكو درێژی دووکەسییە.
*v.t.* (١) بڕینەوە بەم جۆرە مشارە.
(٢) لە دوو سەرەوە لێ بردنەوە؛ دوو جار پێ دۆڕاندن.
(٣) لە دوو سەرەوە بۆڕپێدان یا بەزاندن.

**whip scorpion,** دووپشکێکی بێ ژەهرو بێ چزووە کلکێکی درێژی وەك قەمچی هەیە

**whip snake,** مارێکی بێ ژەهرە بەزۆری لە داروودرەختدا دەژی.

**whip-stitch** (hwip′stich′), *v.t. & v.i.* پەراوێز داگرتنەوە؛ شیرازە یا سیم هەڵپێچان.
*n.* تەقەڵێکی پەراوێز پێ هەڵپێچ.

**whip-stock** (hwip′stok′), *n.* دەسکی قەمچی

**whipt** (hwipt), *alternative past tense and p.p of* **whip.**

**whip-tail** (hwip′tāl′), *n.* مارمێلکەیەکی کلك قامچی ئاساییە.

**whip-worm** (hwip′wūrm′), *n.* کرمە قامچی: کرمێکی باریکە درێژییەکەی دوو ئەنجە سەرێکی لە قامچی دەچێ لە ڕیخۆڵە باریکەدا دەژی.

**whir, whirr** (hwūr), *v.i. & v.t.* فڕەفڕکردن؛ وورەووڕکردن؛ خولانەوە یا فڕینو فڕەفڕکردن؛ فرەفرکردن.
*n.* (١) فڕەفڕ؛ وورەووڕ؛ فرەفڕ. (٢) فڕکەفڕك؛ پەلەپەل؛ پەلە؛ هەڵپە.

**whirl** (hwūrl), *v.i.* (١) سوڕدان؛ سەماکردن؛ قنگ بادان:
*( They ~ed round the dance floor.)*
(٢) خولانەوە؛ سوڕانەوە؛ چەرخانەوە.
(٣) فڕکەفڕك کردن؛ ڕاکەڕاك کردن؛ دەرپەڕین؛ خێرا ڕۆیشتن.
(٤) سەر خولانەوە؛ گێژبوون؛ تووشی سەرەخولێ بوون؛ سەر سوڕخواردن:
*( My head is ~ing.)*
*v.t.* (١) خولاندنەوە؛ سوڕاندنەوە؛ چەرخاندنەوە.
(٢) خول پێدان؛ باپێدان؛ سوڕپێدان: *( The wind ~ed the leaves.)*.
(٣) [Obs.]، هاویشتن؛ هەڵدان.
*n.* (١) خولانەوە؛ سوڕانەوە؛ چەرخانەوە.
(٢) خول؛ سوڕ؛ چەرخە.
(٣) شتێکی خولاوە یا سوڕاوە: *( a ~ of dust)*.
(٤) بەسەر چەند ئاهەنگێکەوە گەڕان بە پەلە.
(٥) دەنگەدەنگ؛ بەزم‌وڕەزم؛ هەراوزەنا؛ جم‌وجوولێکی زۆر.
(٦) سەرەخولێ؛ گێژی؛ وڕی؛ کاسی: *( My head is in a ~ .)*
-whriler *(n.)*.

**whirl-about** (hwūrl′ə-bout′), *n.* (١) خولانەوە؛ سوڕانەوە؛ فڕکەفڕك. (٢) whirligig.

**whirligig** (hwūr′li-gig′), *n.* (١) فرفرۆکە (یاری منداڵان)؛ فرفرە. (٢) merry-go-round. (٣) شتێکی خولاوە یا سوڕاوە.
(٤) سوڕانەوە؛ خولانەوە؛ چەرخانەوە؛ گێژخواردن.
(٥) whirligig beetle.

**whirligig beetle,** قالۆنچەی خولاوە: قالۆنچەیەکی ئاوییە بەسەر ئاوەوە بە خێرایی دەسوڕێتەوە.

**whirling dervish,** دەروێش؛ دەروێشی حاڵ لێهاتوو.

**whirlpool** (hwūrl′pōōl′), *n.* (١) گێژاو؛ گەرداو.
(٢) (ا) شتێکە کە خێرا بخولێتەوە وەك گێژاو.
(ب) ئەم جۆرە خولانەوەیە؛ فڕکەفڕك.

**whirlwind** (hwūrl′wind′), *n.* (١) گەردەلوول؛ گێژەلووکە؛ گێژەبا.
(٢) شتێکی لەپڕ قەوماوو بەهێزو وێرانکەر؛ هێزێکی وێرانکەر.
(٣) فڕکەفڕك؛ ڕاکەڕاك؛ بە قایم خولانەوە.
*adj.* بەهێز؛ قایم؛ توند؛ بێ ووچان:
*( a ~ campaign for his reelection)*
reap the whirlwind, ئەنجامی کاری خراپ هاتنەوە ڕێ؛ ئەوەی با بچێنێ با دەدوورێتەوە.

**whirly** (hwūr′li), *adj.* خولاوە؛ سوڕاوە.

**whirly** (hwūr′li), *n.* گێژەلووکەی بچووك.

**whirly-bird** (hwūr′li-būrd′), *n.* [Slang], = **helicopter.**

**whirr** (hwūr), *v.i. & v.t., n.* = **whir.**

**whirry** (hwūr′i), *v.t. & v.i.* [Scot.], = **whirl.**

**whish** (hwish), *v.i.* فسەفس کردن؛ فسەهاتن؛ وورشانەوە؛ فیشکەکردن.
*n.* فسە؛ فسەفس؛ وورشە؛ فیشکە.

**whisht** (hwisht), *interj.* ووشت!؛ بێ دەنگ بە!.
*adj.* خامۆش؛ بێ دەنگ
*v.t.* بێ دەنگ کردن؛ کپ کردن؛ خامۆش کردن.
*v.i.* بێ دەنگ بوون؛ کپ بوون؛ خامۆش بوون.
*n.* (١) بێ دەنگی؛ خامۆشی. (٢) چرپە؛ فسکە.

**whisk** (hwisk), *v.t.* (١) ( ~ off; ~ away )، دەرکردن؛ لابردن؛ دەست لێ هەڵتەکان: *( to ~ flies away)*.
(٢) بە پەلە بردن؛ فڕاندن: *( They ~ed him off in an ambulance.)*
(٣) ڕاوەشاندن: *( The cow ~ed her tail.)*.
(٤) شڵەقاندن؛ هەڵشڵەقاندن: *( to ~ eggs, cream, etc.)*.
*v.i.* خێرا ڕۆیشتن یا جوڵانەوە: *( The cat ~ed around the corner.)*.
*n.* (١) گسك. (هەروەها " whisk-broom ").
(٢) ئامێری هێلکەو شت هەڵشڵەقان.
(٣) ڕاوەشان:
*( The horse brushed off the flies with a ~ of his tail.)*

**whisk broom,** گسك. هەروەها " **whisk** ").
**whisker** (hwis′kēr), *n.* (١) (*pl.*)، تووکی لاڕوومەت (بەتایبەتی بە درێژی و چەناگەی تاشراوەوە). (٢) (*pl.*)، ڕیش.
(٣) دانەیەك لە مووی ڕیش. (٤) [Archaic]، سمێڵ.
(٥) مووی سمێڵی پشیلەو مشك و... هتد.
(٦) داری ئەم دیوو ئەودیوی داری بایەوان (کەشتیوانی).
-**whiskered** *(adj.)*; **whiskery** *(adj.)*.
**whiskey, whisky** (hwis′ki), *n.* (١) ویسکی. (٢) پێکێ ویسکی.
*adj.* لە ویسکی دروستکراو.
**whiskey sour,** کۆکتێلێکە لە ویسکی و ئاوی لیمۆو شەکر پێکدێت.
**whisper** (hwis′pēr), *v.i.* (١) چرپەکردن؛ چپان بە گوێدا؛ چرپان.
(٢) فسکەفسك کردن؛ بە دزییەوە قسەکردن (پیلان گێڕان)؛ چپەچپ کردن.
*v.t.* (١) بە چرپە پێ ووتن؛ بە گوێدا چرپان: *( He ~ed endearments to her.)*
(٢) بە دزییەوە (پێ) ووتن.
*n.* (١) چرپە؛ چپە. *( She spoke in a ~ .)*.
(٢) فسکەفسك؛ چپەچپ؛ قسەی بە دزییەوە کراو.
(٣) شنە؛ وورشە؛ شنینەوە؛ خشە: *( the ~ of leaves in the wind)*.
**whisperer** (hwis′pēr ēr), *n.* (١) چپەچپکەر؛ بە چرپە دواو؛ بە چپە دوو. (٢) قاوخەرەوە؛ قاوداخەر.
**whispering** (hwis′pēr-iŋ), *n.* (١) چرپە؛ چپە؛ چپەچپ؛ فسکەفسك.
(٢) ووت‌ووات؛ قاو؛ مقۆمقۆ؛ بەندوباو. (٣) شنە؛ شنینەوە؛ وورشە.
*adj.* (١) چپەچپکەر؛ فسکەفسککەر. (٢) چپەچپی؛ فسکەفسکی؛ چپەیی.
(٣) قاوخەرەوە؛ قاوداخەر.
-**whisperingly** *(adv.)*.
**whispering campaign,** قاوخستنەوە بۆ سووك کردنی کەسێك، ڕێکخراوێك، یا مەسەلەیەك؛ هێرشی فسکەفسك
**whisperous** (hwis′pēr-əs), *adj.* = whispery.
**whispery** (hwis′pēr-i), *adj.* (١) چپەیی؛ چرپەیی: *( a soft, ~ voice)*
(٢) پڕ لە چپەچپ؛ چپەچپدار.
**whist** (hwist), *interj.* بێ دەنگ بە!
*adj.* بێ دەنگ؛ خامۆش؛ کپ.
*v.t.* بێ دەنگ کردن؛ کپ کردنەوە؛ خامۆش کردن.
*v.i.* بێ دەنگ بوون؛ خامۆش بوون
*n.* بێ دەنگی؛ خامۆشی
**whist** (hwist), *n.* جۆرە یارییەکی کاغەزە.
**whistle** (hwis′'l), *v.i.* (١) فیکەلێدان؛ فیکەکردن؛ فیکەکێشان؛ فیکاندن.
(٢) لووراندن (با)؛ لوورەلوورکردن: *( The wind ~d past.)*.
(٣) (ا) فیکەلێدان؛ فیکەکێشان: *( The policeman ~d.)*.
(ب) فیقاندن؛ فیکەلێدان؛ فیکەهاتن: *( The train ~d.)*.
*v.t.* (١) ئاواز لێدان بە فیکە: *( to ~ a tune)*.
(٢) فیکە بۆ لێدان (بۆ بانگ کردن)؛ فیکە بۆ کردن؛ فیکە بۆ کێشان.
*n.* (١) فیکە؛ فیقەنە؛ فیقە؛ فیقەفیق. (٢) فیکە؛ دەنگی فیکە؛ فیقە.
(٣) فیکەکردن؛ فیکەکێشان؛ فیکاندن.
(٤) بانگ کردن یا شت پێ ڕاگەیاندن بە فیکە.
(٥) لووره (با). (٦) [Colloq.]، دەموقوڕگ.
**wet one's whistle,** دەم تەڕکردن؛ شت خواردنەوە (شەراب، ئاو، عەرەق... هتد)؛ پێك خواردنەوە.
**whistle for,** خۆزگە بۆ خواستن و بێ ئومێد بوون؛ بەتەمابوون بەبێ سوود.
**whistle in the dark,** وورە ئانەبەر خۆ؛ خۆخەڵافاندن بۆ ترس لەبیرچوونەوە؛ ترس لە بیر خۆ بردنەوە
**whistler** (hwis′lēr), *n.* (١) فیکەکێش؛ فیکەلێدەر.
(٢) باڵندەیەکە خوێندنەکەی لە فیکەلێدان دەچێ
(٣) ئەسپی تەنگەهەناسە. (٤) جۆرە مشکێکی شاخی گەورەی ئەمەریکییە.

**whistle stop,** (١) (ا) ئێستگەیەکی بچووکە کە شەمەندەفەر تیایدا ڕاناوەستێ ئەگەر بە داواکردن نەبێ. (هەروەها " **flag stop** ").
(ب) شارۆچکەیەکە کە ئێستگەیەکی وەهای تێدا بێ.
(٢) وەستانێکی کورتە لە شارۆچکەیەکدا لەلایەن کەسێکی ناودێرکراوەوە بۆ هەڵبژاردن (زۆربەی جار هەر بەبێ دابەزین لە شەمەندەفەرەکە)
**whistle-stop** (hwis′'l-stôp′), *v.i.* وەستانی کورت کورت لە گەلێك شارۆچکە لەلایەن کەسێکەوە کە خۆی ناودێر کردبێ بۆ هەڵبژاردن.
**whistling** (hwis′liŋ), *n.* (١) فیکەکێشان؛ فیکەلێدان؛ لوورەلوورکردن.
(٢) فیکە؛ لوورە؛ فیقە؛ دەنگی فیکە.
(٣) تەنگەهەناسەیی ئەسپ. (پێشی دەووترێ: " **roaring** ").
**whit** (hwit), *n.* ئەختێك؛ تۆزێك؛ ئەختاڵێك؛ هیچ: *( He doesn't seem a ~ concerned.)*
**white** (hwīt), *adj.* (١) سپی؛ چەرموو.
(٢) (ا) زیوی. (ب) سپی هەڵگەڕاو؛ سپی: *( a face ~ with terror)*.
(ج) سپی؛ سپیکار: *( ~ wines)*.
(د) سپی (کاغەز)؛ شت تیا نەنووسراو؛ بەتاڵ.
(هـ) بەفرین؛ بەفراوی؛ سپی: *( a ~ christmas)*.
(٣) سپی پۆش؛ بەرگی سپی لەبەر.
(٤) پاك (ڕەووشت)؛ بێ لەکە؛ بێ گەرد.
(٥) بێ زیان؛ زیان نەبەخش: *( ~ magic; a ~ lie)*.
(٦) [Rare]، بهات (کات، ڕۆژگار، وەرز).
(٧) (ا) ڕەگەز سپی؛ سپی (پێست)؛ قەوقازی.
(ب) تایبەتی بە ڕەگەزی سپی: *( ~ supremacy)*.
(ج) [Slang]، سەرڕاست؛ ڕاست؛ بە ویژدان.
(٨) زۆر گەرم. (٩) کۆنەپەرست.
*n.* (١) ڕەنگی سپی؛ ڕەنگ چەرموو؛ سپی.
(٢) سپێتی: (ا) پێستی سپی یا قەوقازی. (ب) پاکی؛ بێ گەردی؛ بێ لەکەیی
(٣) (ا) سپێنەی هێلکە. (ب) سپێنەی چاو.
(ج) شوێنی سپی یا شت تێدا نەنووسراوی پەڕە کاغەز؛ سپیایی.
(٤) (ا) قوماشی سپی
(ب) (*pl.*)، جل‌وبەرگی سپی (وەك هی قەشەو پاپا یا هەندێ پیشە).
(ج) شەرابی سپی. (د) بۆیەی سپی.
(هـ) توخمی سپی (بەتایبەتی بەران). (و) ئاردی سپی.
(٥) ئادەمیزادی سپی یا قەوقازی؛ کەسێکی پێست سپی.
(٦) ئەندامی حیزب یا ڕێکخراوێکی کۆنەپەرست.
(٧) (*pl.*)، **leucorrhea**.
(٨) (ا) [Archaic]، نیشانی سپی (تیربازی).
(ب) ئەڵقەی دەرەوەی نیشان. (ج) پێکانی ئەم ئەڵقەیە.
(٩) (ا) داشی سپی (دامەوشەترەنج). (ب) یاریکەری داشی سپی.
*v.t.* (١) سپیکردنەوە.
(٢) ( **~ out** )، شوێن یا هێڵی سپی بەجێهێشتن لە پەڕەی کاغەزدا (چاپەمەنی)؛ کوژاندنەوە بە شلەی سپی (نووسین): *( ~ out this line.)*
**bleed white,** نابووت کردن؛ بێ پووڵ و پارە کردن؛ پووڵ و پارە پێ نەهێشتن.
**white ant,** = **termite.**
**white-bait** (hwīt′bāt′), *n.* (١) بەچکەی جۆرە ماسییەکی بچووکە بە بچووکی دەخورێ. (٢) چەند جۆرە ماسییەکی بچووکە.
**white bear,** = **polar bear.**
**white-beard** (hwīt′bērd′), *n.* پیرەمێردی ڕیش سپی؛ پیاوی ڕیش سپی
**white birch,** سپیدار؛ چنار.
**white blood cell,** = **leukocyte** = **white corpuscle.**
**white book,** کتێبە سپی: ڕاپۆرتێکی بەرگ سپییە میری دەریدەکات لەسەر مەسەلەیەکی تایبەتی.
**white bread,** نانی سپی.

**white-cap** (hwīt′kap′), *n.* (١) شەپۆلی کەفدار.
(٢) [W-]، کڵاو سپی: ئەندامی ڕێکخراوێکی نهێنییە کە بەناو کۆمەڵ دەپارێزی و بە ڕاستیش خەڵکی وەک قولەرەش دەچەوسێنێتەوە و دەتۆقێنێ (کڵاوی سپی لەسەر دەکەن)

**white cedar,** درەختی "ئەرز" ی سپی.

**white clover,** وێنجەی سپی (گوڵی سپی خڕ دەگرێ).

**white coal,** ئاو وەک سەرچاوەیەکی ووزە

**white-collar** (hwīt′kol′ẽr), *adj.* یەخە سپی: تایبەتی بەوانەی ئیشی پاک دەکەن و دەستیان پیس نابێ (وەک فەرمانبەر و مووچەخۆر)، نەک کرێکار: تایبەتی بە ئیشی ئەم جۆرە کەسانە: *( ~ jobs; ~ workers)*.

**white corpuscle,** = white blood cell.

**white crappie,** = crappie.

**white daisy,** = daisy.

**whited** (hwītd), *adj.* سپی کراوەتەوە؛ ڕووکەشی سپی کراو.

**white sepulcher,** دووڕوو؛ بێ بار؛ کەسێکی بەدی بە خواپەرست خۆدەرخستوو

**white elephant,** فیلە سپی (ا) فیلێکی سپیکەڵەی هیندییە (بە پیرۆز دادەنرێ لای هەندێ کەس) (ب) زەوی‌وزار یا خانوویەکە ڕاگرتنی زۆری تێ بچێ و بێ بەرهەم بێ. (ج) شتێکی بێ کەڵک.
(د) شتێکە کە خاوەنەکەی ئیتر نەیەوێت ئەگەرچی خەڵکی تر بەدڵیان بێ.
(ھ) پرۆژەیەکی سەرنەکەوتوو

**white-faced** (hwīt′fāst′), *adj.* (١) دەم‌وچاو سپی هەڵگەڕاو.
(٢) مارو: ئەسپ و ڕەشەووڵاخی ناوچەوان سپی

**white feather,** نیشانەی ترسنۆکی. (لەوەوە هاتووە کە ئەگەر کەڵەشێرێک پەڕی سپی لە کلکیدا بووبێ بە ترسنۆک و شەڕنەکەر دانراوە).

**show the white feather,** ترسنۆکی پیشاندان؛ ترسنۆکی نواندن.

**white-fish** (hwīt′fish′), *n.* (١) ماسی سپی. (٢) beluga.

**white flag,** ئاڵای سپی. نیشانەی خۆبەدەستەوەدان یا شەڕ وەستان؛ بەیداخی سپی

**white gold,** زێڕی سپی. زێڕی تێکەڵاوکراو لەگەڵ لە سەدا بیست پلاتین یا جینکۆ ... هتد.

**white-hall** (hwīt′hôl′), *n.* (١) کۆشکی شاهانەی کۆنی ئینگلیز.
(٢) شەقامێکە بە "وێستمنستەر" (لەندەن) کە بارەگای چەند وەزارەتێکی ئینگلتەرەی لەسەرە. (٣) میری بەریتانیا؛ فەرمانڕەوایی ئینگلتەرە.

**white-headed** (hwīt′hed′id), *adj.* (١) سەرسپی (مرۆڤ، باڵندە... هتد). (٢) قژزەرد. (٣) [Irish]، پەسەندترین؛ باشترین: *( the ~ boy)*.

**white heat,** (١) گەرمای سپی: پلەیەکی گەرمی ئێجگار بەرزە کە کانزا سپی دەنوێنێ تێیدا. (٢) زۆر هەڵچوون؛ زۆر جۆش خواردن (هەست)؛ گڕگرتن؛ توورەیی؛ گەشکە

**white-hot** (hwīt′hot′), *adj.* (١) ئێجگار زۆر گەرم (کانزا)؛ گڕگرتوو.
(٢) زۆر هەڵچوو؛ زۆر تووڕە؛ زۆر جۆش خواردوو؛ گەشکەدار؛ گڕ تێ بەربوو.

**White House, the,** کۆشکی سپی (ا) ماڵ و بارەگای سەرکۆماری ئەمەریکا (ب) دەسەڵاتی هەرە بەرزی لقی کارگێڕی میری ئەمەریکا؛ فەرمانڕەوایی ئەمەریکا.

**white lead,** قوڕقوشمی سپی: ئاوێتەیەکە لە بۆیەدا بەکاردێت.

**white leather,** چەرمی سپی (بە زاخ و خوێ خۆش دەکرێ).

**white lie,** درۆی سپی: درۆیەکی بێ زیانە بە نیازێکی باش دەکرێ بۆ خۆبەراندنەوە و بۆ چاکەی گوێگرەکەیش: *( to tell a ~ )*

**white-livered** (hwīt′liv′ẽrd), *adj.* ترسنۆک

**white man's burden,** ئەرکی سەرشانی پیاوی سپی: هەستی گەلە سپییەکانە، واتە ئەورووپاییەکان، کە گوایە پێویستە لەسەریان گەلەکانی تر فێری شارستانیەتی بکەن.

**white matter,** ماددەی سپی. شانەی سپی مێشک و مۆخی بڕبڕە.

**white meat,** (١) گۆشتی سپی: سنگە مریشک و قەل. (ووشەی " red meat " ببینە).

(٢) [Obs. or Dial.]، پەنیر و کەرە و شیرەمەنی تر.

**white metal,** کانزای سپی یا زیوی: ئاوێتەیەکە قوڕقوشم و تەنەکەی زۆر تێدا بێ.

**whiten** (hwīt′′n), *v.t.* سپیکردنەوە.
*v.i.* سپی بوونەوە.

**whitener** (hwīt′′n-ẽr), *n.* ماددەی سپیکەرەوە؛ سپیکەر؛ سپیکەرەوە.

**whiteness** (hwīt′nis), *n.* (١) سپێتی؛ ڕەنگی سپی.
(٢) ڕەنگ سپی هەڵگەڕان؛ بێ ڕەنگی؛ ڕەنگ زەردیی دەم‌وچاو
(٣) بێ لەکەیی؛ بێ گەردی؛ پاکی (٤) ماددەی سپی؛ سپیایی؛ شوێنی سپی

**whitening** (hwīt′′n-iŋ), *n.* (١) سپیکردنەوە. (٢) سپی بوونەوە.
(٣) ماددەی سپیکەرەوە.

**white oak,** (١) داربەڕووی سپی. (٢) داروتەختەی سپی ئەم بەڕووە.

**white paper,** نامەی سپی: بڵاونامەیەکی بەرگ سپییە میری دەریدەکات لەسەر مەسەلەیەک (بەتایبەتی هی جیهانی)

**white perch,** ماسییەکی زیویی بچووکە

**white pine,** (١) کاجی سپی. (٢) داروتەختەی ئەم جۆرە کاجە.

**white plague,** دەردەباریکە؛ سیل.

**white poplar,** (١) سپیدار؛ چنار. (٢) دارچنار؛ داروتەختەی سپیدار.

**white race,** ڕەگەزی سپی؛ ڕەگەزی قەوقازی.

**white sauce,** سۆسی سپی: بە ئارد و شیر و کەرە دەکرێ.

**white slave,** بەندی سپی: ژنێکە کە بەزۆر قەحبەچێتی پێ دەکرێ.

**white-slave** (hwīt′slāv′), *adj.* (١) هی بەندی سپی؛
تایبەتی بە بازرگانی کردن بە بەندی سپییەوە: *( ~ traffic)*
(٢) دژی بازرگانی کردن بە بەندی سپییەوە.

**white slaver,** دەڵاڵی بەندی سپی (ووشەی پێشووتر ببینە)؛ گەوادی قەحبەی زۆرەملێ.

**white slavery,** قەحبەیی زۆرەملێ (سێهەم ووشەی پێشوو ببینە).

**white-simth** (hwīt′smith′), *n.* تەنەکەچی.

**white supremacist,** لایەنگری بیروڕای بەرزێتی ڕەگەزی سپی.

**white supremacy,** بەرزێتی ڕەگەزی سپی: بیروڕایەکە دەڵێت: کە گوایە ڕەگەزی سپی لەوانی تر بەرزتر و چاکترو لە پێشترە.

**white-tailed deer,** ئاسکی کلک سپی: ئاسکێکە بنی کلکی سپییە (هەروەها پێی دەووترێ: " white-tail " ، " Virginia deer " )

**white-throat** (hwīt′thrōt′), *n.* قورگ سپی: مەلێکی ئەوروپاییە لە کۆمەڵەی چۆلەکە قورگ و ژێر سکی سپییە

**white-throated sparrow,** چۆلەکەیەکی ئەمەریکاییە پەڵەیەکی سپی بە قورگییەوەیە.

**white tie,** (١) بۆینباخی گوڵبەستی سپی.
(٢) بەرگی ڕەسمی ئێوارانی پیاوانە.

**white trash,** (١) کەسێکی سپی هەژار (بەتایبەتی خەڵکی خوارووی ئەمەریکا). (٢) چینی سپی هەژار یا بێ دەرامەت بەگشتی (لەڕووی سووکییەوە).

**white vitriol,** زاجی سپی (کیمیا). (هەروەها " zinc sulfate " )

**white-wash** (hwīt′wôsh′, hwīt′wäsh′), *n.* (١) گەچاو؛ قسڵاو؛ سپیکاری؛ گەچکاری؛ بۆیەکاری؛ سواغ. (٢) سپیاو (ئارایشت)
(٣) ڕووکەشکاری؛ داپۆشین (کەم‌وکووڕی)؛ بۆیەکاری (مەجاز)؛ لەکە شاردنەوە و بە بێ تاوان پیشاندان:
*( The report was a ~ of the scandal.)*
(٤) [Colloq.]، بۆرپێدانێکە کە دۆڕاو هیچ خاڵێکی تێدا ناگرێ
*v.t.* (١) گەچکاری کردن؛ سواغدان؛ سپیکردنەوە؛ بۆیەکردن.
(٢) ڕووکەشکردن؛ داپۆشین (کەم‌وکووڕی)؛ شاردنەوەی لەکە و کەم‌وکووڕی و بە پاک پیشاندان؛ بۆیەکردن (مەجاز):
*( to ~ an investigation, a person's reputation, etc.)*
(٣) [Colloq.]، بۆرپێدان بە شێوەیەک کە دۆڕاو هیچ خاڵێک نەگرێ.

**white water,** ئاوی کەفاوی (تافگە، ڕێژاو، شەپۆل).

**white whale,** = beluga.
**white-wing** (hwīt′wiŋ′), *n.* گسکدەری جل سپی.
**whitewood** (hwīt′wood′), *n.* (١) درەختی دار سپی.
(٢) داروتەختەی سپی.
**whither** (hwith′ẽr), *adv.* (١) بو کوێ؟ بەرەو کوێ؟:
*( ~ are we drifting?)*
(٢) ئەو شوێنەی کە؛ کە؛ کە بۆی: *( the island ~ we drifted)*.
(٣) (بۆ) هەرکوێیەك؛ (بۆ) هەرشوێنێك: *( Let them go ~ they will.)*.
**whithersoever** (hwith′ẽr-sō-ev′ẽr), *adv.* = wherever.
**whitherward** (hwith′ẽr-wẽrd), *adv.* = where.
**whiting** (hwīt′iŋ), *n.* چەند جۆرە ماسییەکە.
**whiting** (hwīt′iŋ), *n.* تۆزی گەچ؛ ئاردی گەچ.
**whitish** (hwīt′ish), *adj.* سپیکار؛ سپیکەلە
**whitlow** (hwit′lō), *n.* مووی پەنجە؛ برینێکی بە ئازارە لە پەنجە دێت.
(هەروەها " felon ")
**whittle** (hwit′'l), *v.t.* (١) دار تاشین (بە چەقۆ)؛ شوولکەدار تاشین و باریك کردنەوە. (٢) داتاشین؛ تاشین (پەیکەر)؛ لەلەکردن:
*( He ~d a small bird for his son.)*
(٣) (~ down; ~ away)، بەرەبەرە کەمکردنەوە؛ وردەوردە هیچ نەهێشتنەوە یا لێ داشکاندن:
*( They are trying to ~ down our salaries.;*
*to ~ down expenses)*
*v.i.* دار تاشین (بەتایبەتی تاشینی شوولکە دارێك بە چەقۆ بۆ خۆخلافاندن و کات کوشتن).
*n.* [Obs.], چەقۆ
**whity, Whity** (hwīt′i), *adj.* سپیکەلە. نازناوە بۆ کەسێکی قژزەردی سپی پێست (بەتایبەتی بۆ بانگ کردن).
**whiz, whizz** (hwiz), *v.i.* (١) ویزاندن؛ ویزەکردن؛ گڤەکردن.
(٢) بە گڤە بە لادا تێپەڕبوون؛ ویزەکردن و بە تیژی بە لادا تێپەڕبوون؛ بە گڤە تێ تەقان: *( The bullet ~ed past him.)*.
*v.t.* خێرا حولاندنەوە و گڤەگڤ لێ هەڵستان؛ فرەفرپێکردن.
*n.* (١) ویزە؛ ویزەویز؛ گڤە؛ گڤەگڤ؛ فرەفر.
(٢) لەپڕ گڤەکردن بە لادا (وەك گوللە)؛ بە ویزە تێپەڕین.
(٣) گەشتێکی خێراو لەپڕ.
(٤) [Slang]. بلیمەت؛ کەسێکی زۆر شارەزاو زیرەك لە ڕشتەیەکدا:
*( a computer ~ ; He is a ~ at math, physics, etc.)*
**whiz-bang** (hwiz′baŋ′), *n.* (١) گوللەیەکی بچووکی تیژڕەوی جەنگی جیهانی دووەمە پێش تەقینەوەی بە توزێك دەنگی تەقینی دەهات.
(٢) فیشەکە شێتە
*adj.* [Colloq.], بلیمەت؛ زۆر لێهاتوو؛ زۆر شارەزاو زیرەك.
**whiz kid,** [Slang]. لاوی بلیمەت؛ گەنجی زۆر زیرەك و لێهاتوو
**who** (hōō), *pron.* (١) کێ؟: *( W~ is that girl?; W~ came?)*.
(٢) کێ: *( I don't know ~ came.)*.
(٣) کە؛ (ئەو کەسەی) کە: *( the man ~ came to dinner)*.
(٤) ئەو کەسەی کە؛ هەرکەس: *( W~ steals my purse steals trash.)*.
**who's who,** (١) خەڵکی بەناوبانگ.
(٢) [W - W-]. ناونامە یا کتێبێکە ناو و کورتەیەکی ژیانی کەسایەتییە بەناوبانگەکانی وڵاتێك، شارێك، یا پیشەیەکی تێدایە.
**whoa** (hwō), *interj.* هۆش! (بۆ وەستانی ئەسپ وکەر... هتد)؛ وەش!
**whodunit** (hōō-dun′it), *n.* [Slang]. کێ کردی؟ چیرۆك یا فیلمی پۆلیسی: چیرۆك یا فیلمێکی لێڵ و ئاڵۆزە کە مەبەستی سەرەکی دۆزینەوەی تاوانکارەکەیە
**whoever** (hōō-ev′ẽr), *pron.* (١) هەرکەسێ؛ هەرکەس:
*( ~ did it should be proud.)*
(٢) گرنگ نییە هەرکەسێ بێ؛ نازانم کێش بێ:
*( I won't do it, ~ asks.)*
(٣) کێ؟ (لەڕووی سەرسامییەوە)؛ چ کەسێ؟:
*( W ~ told you such a thing?)*
**whole** (hōl), *adj.* (١) (ا) ساغ؛ لەش ساغ؛ تەندروست.
(ب) [Archaic]، ساڕێژ؛ چاك بووەتەوە.
(٢) ساغ؛ نەشکاو؛ سەرمۆر؛ دەست تێوە نەدراو.
(٣) تەواو؛ گشت: *( Tell me the ~ truth.)*.
(٤) هەمووی پێکەوە؛ بە یەك پارچە؛ تەواو: *( They cooked a ~ sheep.)*.
(٥) ڕەبەق؛ هەموو: *( It rained for a ~ week.; a ~ year)*.
(٦) تەواو؛ هی دایکی وباوکی: *( a ~ brother)*.
(٧) تەواو (ژمارە لە بیرکاریدا)؛ کەرت نییە:
*( 10, 12, 19 and 50 are ~ numbers.)*
*n.* (١) هەمووی؛ گشتی؛ سەرجەم. (٢) شتێکی تەواو یا کۆ.
**as a whole,** تێکڕا؛ هەمووی؛ بەگشتی؛ بە تێکڕایی؛ بە شێوەیەکی گشتی.
**on the whole,** بە شێوەیەکی گشتی؛ بەگشتی.
**whole-hearted** (hōl′här′tid), *adj.* بەدڵ؛ گەرم؛ بە دڵ و بە گیان؛ تەواو: *( a ~ welcome, support, effort, etc.)*.
-wholeheartedly *(adv.)*; wholeheartedness *(n.)*.
**whole-hog** (hōl-hog′), *adj.* [Slang], تەواو؛ سەرانسەر:
*( a ~ patriot)*
**whole hog,** [Slang], هەمووی؛ تا پەڕی ئەوپەڕ:
*( to go the ~ )*
**wholeness** (hōl′nis), *n.* ساغی؛ یەك پارچەیی؛ پێکەوەیی؛ هەموویی؛ تەواوێتی.
**whole number,** ژمارەی تەواو (بیرکاری): *( 20 is a ~ .)*.
(هەروەها " integer ")
**wholesale** (hōl′sāl), *n.* کۆفرۆشی؛ بە کۆمەڵ فرۆشتن.
*adj.* (١) کۆفرۆش؛ هی کۆمەڵ فرۆشی؛ هی کۆمەڵ
(٢) هی کۆفرۆشی؛ بە کۆمەڵ فرۆشراو:
*( What is the ~ price of these watermelons?)*
(٣) گشتی؛ بە کۆمەڵ:
*( Modern warfare involves the ~ destruction of people.)*
*adv.* بە کۆ؛ بە کۆفرۆشی؛ بە کۆمەڵ:
*[ He bought (or sold) them ~ . ]*
*v.i.* کۆفرۆشی کردن؛ بە کۆمەڵ فرۆشران:
*( These pens ~ at one dollar apiece.)*
*v.t.* بە کۆمەڵ فرۆشتن.
**wholesaler** (hōl′sāl′ẽr), *n.* کۆفرۆش.
**wholesome** (hōl′səm), *adj.* (١) سازگار؛ ساز؛ سووك (ئاو):
*( a ~ climate, diet, etc.)*
(٢) باش (بۆ مێشك و ڕەووشت)؛ چاك؛ بەکەڵك؛ خاوێن:
*( a ~ movie; ~ advice, tales, etc.)*
(٣) ڕەنگ و ڕوو باش؛ تەندروست؛ لەش ساغ:
*( a ~ appearance; a ~ girl)*
-wholesomely *(adv.)*; wholesomeness *(n.)*.
**whole-souled** (hōl′sōld′), *adj.* = whole-hearted.
**whole-wheat** (hōl′hwēt′), *adj.* (١) بە گەنم و کەپەك کراو؛ هی گەنم و کەپەکەکەی: *( ~ flour)*.
(٢) بە ئاردی گەنم و کەپەك کراو: *( ~ bread)*.
**who'll** (hōōl), = who shall; who will.
**wholly** (hō′li), *adv.* بەتەواوی: *( I don't ~ agree.)*.
**whom** (hōōm), *pron.* (١) (ا) کێ؟: *( W~ did you see?)*.
(ب) کێ: *( Tell me ~ you saw.)*.
(٢) (ئەو کەسەی) کە؛ کە:
*( The woman ~ you saw is my teacher.)*

(٣) ئەوەی؛ ئەوانەی: *( W~ the gods love die young.)*.

**whomever** (hōōm-ev'ēr), *pron.* هەرکەسێك؛ هەرکەس؛ ئەوەی؛ ئەو کەسەی

**whomsoever** (hōōm'sō-ev'ēr), *pron.* هەرکەسێك؛ هەرکەس؛ ئەوەی؛ ئەو کەسەی

**whoop** (hōōp, hwōōp), *n.* (١) هاوار؛ قیژە

(٢) خوێندنی کوندەبەبوو؛ هووها.

(٣) دەنگی هەناسەدان یا هەناسەبڕکێی کەسێکی کۆکەرەشەدار.

*v.i.* (١) قیژاندن؛ هاوارکردن؛ قریواندن.

(٢) خوێندن (وەك کوندەبەبوو)؛ هووهاکێشان.

(٣) هەناسەدان بە دەنگی بەرزو بە گران (وەك یەکێك کە کۆکەرەشەی بێت).

*v.t.* (١) بە قیژەقیژەوە ووتن؛ بە قریوە یا هاوارەوە ووتن.

(٢) هاندان بە دەنگی بەرز؛ تێ کردن (سەگ)؛ قریواندن؛ قریوە بەسەردا کردن؛ لێخوڕین بە هاوار هاوار: *( ~ping the horses on down the road)*.

*interj.* قریوەقریو؛ قریوەی خۆشی.

**not worth a whoop**, [Colloq.], بێ فەڕ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ نرخ.

**whoop it ( or things ) up**, [Slang], (١) ئاهەنگ گێڕان‌و قریواندن؛ کاتێکی خۆش بردنە سەر بە قریوەقریو:

*( They whooped it up after winning a big game.)*

(٢) هێنانە جۆش (بە پڕوپاگەندە)؛ وورووژاندن.

**whoop-de-do, whoop-do-doo**, [Colloq.], (١) ئاهەنگ‌و زەماوەند (٢) مشت‌ومڕێکی زۆر؛ هەراوهوریا.

**whoopee** (hwōō'pē, hwoop'ē), *interj. & n.* هوپێی‌ی؛ قریوەی خۆشی؛ قریوەقریو.

**whooper** (hōō'pēr, hwōō'pēr), *n.* (١) قریوەکەر.

(٢) جۆرە قووینگە قووقەیەکی تایبەتی هەیە (هەروەها " whooper swan ").

**whooping cough**, کۆکەرەشە (هەروەها " pertussis ").

**whooping crane**, قولنگ

**whoops** (hwōōps, hwoops), *interj.* نووپس! ووتەیەکە لەڕووی سەرسامی یا داوای لێبووردنەوە دەووترێ لە کاتی هەڵەو قسە لە دەم دەرچوون، پێ هەڵکەوتندا، یا ئیشێکی ناقۆلا کردندا... هتد.

**whop** (hwop), *v.t. & v.i.* [Archaic or Dial.], (١) ڕاتەکاندن

(٢) لێدان؛ ڕەمە لێ هەڵسان؛ تێهەڵدان؛ تێسرەوان (٣) زۆر چاك بەزاندن.

*n.* ڕەمە؛ پیاکێشان بە توندی؛ تەپە. (هەروەها " whap ").

**whopper** (hwop'ēr), *n.* [Colloq.], (١) شتێکی ئێجگار زل.

(٢) درۆیەکی زل

**whopping** (hwop'iŋ), *adj.* [Colloq.], زۆر زل؛ زۆر گەورە؛ باش؛ نایاب.

**whore** (hôr, hōr), *n.* قەحبە؛ نافرەتی سووك.

*v.i.* (١) قەحبەیی کردن؛ بوون بە قەحبە. (٢) قەحبە گاین؛ قەحبەبازی کردن.

*v.t.* [Archaic], کردن بە قەحبە.

**whoredom** (hôr'dəm, hōr'dəm), *n.* (١) قەحبەیی؛ قەحبەیی کردن (٢) بت پەرستی؛ بت پەرستن.

**whorehouse** (hôr'hous', hōr'hous'), *n.* قەحبەخانە؛ کەللەچی.

**whoremaster** (hôr'mas'tēr, hōr'mäs'tēr), *n.* (١) قەحبەکێ؛ قەحبەباز (٢) گەواد.

**whoremonger** (hôr'muŋ'gēr, hōr'muŋ'gēr), *n.* whoremaster.

**whoreson** (hôr's'n, hōr's'n), *n.* [Archaic], زۆڵ؛ کوڕی قەحبە؛ قەحبە دایك.

**whorish** (hôr'ish, hōr'ish), *adj.* قەحبانە؛ قەحبە ئاسا؛ سووك.

**whorl** (hwūrl, hwôrl), *n.* (١) چەرخی خەرەك.

(٢) پێچی بەری پەنجە. (٣) پێچی قاقلەی گوێچکەماسی‌و قاقلە جنۆکە.

(٤) پێچی ئەخشی خانوو.

**whorled** (hwūrl, hwôrl), *adj.* پێچ پێچۆکە؛ پێچدار؛ پێچ پێچاوی.

**whort** (hwūrt), *n. Also* **whortle**, = **whortleberry**.

**whortleberry** (hwūr't'l-ber'i), *n.* ڕووەکێکە لە توخمی تووترك.

**who's** (hōōz), = **who is**.

**whose** (hōōz), *pron.* (١) هی کێ؟:

*( W~ house is that? . I wonder ~ house that is.)*

(٢) هی ئەو کەسەی کە:

*( This is the man ~ house we have just passed.)*

**whosesoever** (hōōz'sō-ev'ēr), *pron.* هی هەرکەسێك.

**whosever** (hōōz-ev'ēr), *pron.* هی هەرکەسێك.

**whoso** (hōō'sō), *pron.* [Archaic], = **whoever**.

**whosoever** (hōō'sō-ev'ēr), *pron.* = **whoever**.

**why** (hwı), *adv.* (١) (ا) بۆچی؟؛ بۆ؟؛ لەبەرچی؟؛ لەسەرچی؟:

*( ~ did he go?)*

(ب) بۆ؛ بۆچی؛ لەسەرچی؛ لەبەرچی: *( I'll tell you ~ he went.)*.

(٢) لەسەر ئەوە؛ بۆیە؛ لەبەرئەوە کە:

*( I see no reason ~ you shouldn't go.)*

*n.* هۆ: *( Never mind the ~ and wherefore.)*.

*interj.* خۆ؛ ووتەی دەربڕینی سەرسامی، توورەیی، بێ ئارامی... هتد.

**whydah** (hwid'ə), *n.* = **whidah**.

**wick** (wik), *n.* پلیتە.

**wick** (wik), *n.* دێ؛ گوند؛ شارۆچکە؛ شار.

**wicked** (wik'id), *adj.* (١) (ا) بەد؛ خراپ؛ ناپەسەند: *( ~ habits)*.

(ب) بەدکار؛ بەدکردار؛ بەدخوو؛ گوناهکار؛ بەد؛ بەد ڕەووشت:

*( a ~ man; ~ people)*

(٢) شەیتانانە؛ کەتنبازانە؛ بێ حەیا: *( a ~ smile, look, etc.)*.

(٣) سەخت؛ توندوتیژ: *( a ~ storm, winter, etc.)*.

(٤) قورس‌و ناخۆش: *( a ~ exam)*.

(٥) چەمووش؛ سەرکێش؛ بێ حەیا: *( a ~ horse)*.

(٦) زۆر سەخت‌و ناخۆش: *( ~ roads)*.

(٧) پیس؛ بۆگەن؛ ناخۆش: *( a ~ odor)*.

(٨) [Slang]، نایاب؛ زۆر چاك؛ لێهاتوو: *( He plays a ~ trumpet.)*.

**-wickedly** *(adv.)*.

**wickedness** (wik'id-nis), *n.* (١) بەدی؛ بەدکاری؛ بەدکرداری؛ بەدخوویی؛ گوناهکارێتی؛ بەدخوازی؛ بەدڕەووشتی.

(٢) کردەوەی پیس‌وخراپ؛ کاری بەد؛ کاری بەدخوانە.

**wicker** (wik'ēr), *n.* (١) توول؛ شوول؛ چڵی نەرم‌و باریك.

(٢) (ا) توولی بەرچنەو زەمیلەو سەبەتەو کورسی پێ چنراو.

(ب) شتی بە توول چنراو: زەمیلە؛ سەبەتە؛ بەرچنە... هتد.

*adj.* بە توول چنراو؛ بە توول کراو.

**wickerwork** (wik'ēr-wūrk'), *n.* (١) توولی چنراو (بۆ زەمیلەو کورسی... هتد دروستکردن). (٢) شتی بە توول دروستکراو یا چنراو (زەمیلە، سەبەتە، کورسی... هتد).

**wicket** (wik'it), *n.* (١) دەرگا یا چەپەری بچووك (بەتایبەتی کە لەناو یا لە تەنیشت دەرگایەکی گەورەدا بێ).

(٢) پەنجەرەی بلیت فرۆشتن‌و پارە گۆڕینەوە لە بانق... هتد.

(٣) (ا) داری گۆڵی یاری " کریکێت ". (ب) ماوەی نێوان دوو دار لەم دارانە.

(ج) کایەی تەواو نەبوو. (د) نۆرەی ئەم یارییە.

(٤) ئەڵقە (یاری " کریکێت ").

**wicket-keeper** (wik'it-kēp'ēr), *n.* گۆڵچی یاری کریکێت.

**wicking** (wik'iŋ), *n.* دەزووی بادراوی پلیتە دروستکردن.

**wickiup, wikiup** (wik'i-up'), *n.* کۆختە یا ڕنجێکی قووچکەیی هیندییەکانی ئەمەریکایە بە قامیش‌و قەرەمو پووش... هتد دادەپۆشرێ یا دەوردەگیرێ.

**wicopy** (wik'ə-pi), *n.* چەند جۆرە درەخت‌و دەوەنێکی ئەمەریکین

چلەکانیان جیێن.

**wide** (wīd), *adj.* (١) پان. ***( a ~ road)*** .
(٢) ئەوەندە پانە: ***( a ribbon two inches ~ )*** .
(٣) بلاو؛ فراوان؛ مەوداکەی زۆرە؛ زۆر:
***( a ~ variety, selection, etc.; ~ reading)***
(٤) دەلب؛ گەورە؛ فراوان: ***( a ~ blouse)*** .
(٥) کراوە؛ بە تەواوی کراوەتەوە: ***( Look with ~ eyes.)*** .
(٦) ~ of)، دوور (لە نیشان یا مەبەستەوە): ***( ~ of the target)*** .
(٧) شل (دەنگناسی)؛ زمان و لێو... هتد خاو یا شلن لە کاتی بێژانیدا (وەك تیپی " i " و " e " لە " bit " و " bed " دا).
*adv.* (١) بە هەموولایەکدا؛ زۆر (دووری، بلاوی):
***( He traveled far and ~ .)***
(٢) بە تەواوی؛ هەمووی: ***( The door is ~ open.)*** .
(٣) دوور لە نیشان یا مەبەست: ***( His blow went ~ .)*** .
**-wideness** *(n.)*.

**wide-angle lens,** هاوێنەی گۆشە فراوان (کامێرا).

**wide-awake** (wīd'ə-wāk'), *adj.* (١) بەخەبەر؛ نەنوستوو.
(٢) وریا؛ هۆشیار؛ بەئاگا.
*n.* جۆرە شەپقەیەکی خوری لێوار بلاوی کۆنە. (هەروەها " wide-awake hat ").

**wide-eyed** (wīd'īd'), *adj.* (١) چاو نەبلەق (لە سەرسامیدا)؛ واق وورماو (٢) ساویلکە.

**widely** (wīd'li), *adv.* (١) بە هەمووڵایەکدا؛ زۆر (دووری، بلاوی، مەودا):
***( He's traveled ~ .)***
(٢) زۆر؛ تا رادەیەکی زۆر؛ نێجگار:
***( The two plans are ~ different.)***

**widen** (wīd''n), *v.t. & v.i.* پان کردن؛ فراوان کردن.

**wide-open** (wīd'ō'p'n), *adj.* (١) بەتەواوی کراوەتەوە؛ کراوە؛ لەسەر پشت ***( a ~ door)*** .
(٢) بەرەڵا: ***( a ~ city, town, etc.)*** .

**wide-spread** (wīd'spred'), *adj. Also* **wide-spreading.** (١) پان؛ ئەرز فرێداو؛ فراوان. (٢) بلاو؛ گەلێك شوێن یا کەسی گرتووەتەوە:
***( ~ poverty, disease, and corruption)***

**widgeon, wigeon** (wij'ən), *n.* جۆرێکە لە مراوی.

**widow** (wid'ō), *n.* (١) بێوەژن.
(٢) دەستێك یا کاغەزدانێکی زیادە (یاری کاغەزو قومار).
(٣) ووشەیەك یا دێرێکی ناتەواوی بە تەنهای کۆتایی بەندێك یا لاپەرەیەك.
*v.t.* (١) بێوەژن کردن؛ بوون بە بێوەژن؛ مێرد کوشتن:
***( She was ~ed by the war.)***
(٢) بێ بەش کردن لە شتێکی بەنرخ.
(٣) [Rare]، مانەوە دوای مێرد مردن.
(٤) [Rare]، مافی بێوەژن پێدان

**widow bird,** = whidah.

**widower** (wid'ō-ẽr), *n.* بێوەپیاو.

**widowhood** (wid'ō-hood'), *n.* (١) بێوەژنی؛ بێوەژنیتی.
(٢) ماوە یا کاتی بێوەژنیتی.

**widow's cruse,** ئازووقەی بێ پایان

**widow's mite,** دیارییەکی بچووك یا یارمەتییەکی کەمە لە کەسێکی دەستکورتەوە.

**widow's peak,** تووکی ناوچەوانی لە شێوەی " V " دا ڕوواو، واتە نووك شۆڕبووەوە (گوایە نیشانەی زوو بوون بە بێوەژنییە).

**width** (width), *n.* (١) پانێتی؛ پانی؛ فراوانی؛ بلاوی.
(٢) پانایی؛ پانی: ***( the ~ of a street)***
(٣) شتێکە کە پانییەکی تایبەتی هەبێ:
***( She sew two ~s of cloth together.)***

**widthwise** (width'wīz), *adv. Also* **widthways,** لە باری پانی.

**wield** (wēld), *v.t.* (١) بە باشی بەکارهێنان (چەك، ئامێر)؛ بە دەستەوە گرتن:
***( to ~ an ax, a gun, etc.; He who ~s the dagger inherits the throne.)***
(٢) دەسەلات بوون؛ دەست ڕۆیشتن؛ دەسەلات بەکارهێنان:
***( He ~s a lot of power in the new government.; He ~s his power justly.)***
(٣) [Obs.]، بەڕێوەبردن؛ ڕابەری کردن.
**-wieldable** *(adj.)*; **wielder** *(n.)*.

**wieldy** (wēl'di), *adj.* بە ئاسانی بەکاردەهێنرێ (ئامێر)؛ دابین دەکرێ.

**wiener** (wē'nẽr), *n. Also* **weenie, weeny,** = **frankfurter.**

**wienerwurst** (wē'nẽr-wũrst'), *n.* = **wiener.**

**wife** (wīf), *n.* (١) ژنی مێردار؛ ژن؛ خێزان؛ کەیبانوو؛ هاوسەر.
(٢) [Archaic]، ئافرەت؛ ژن: ***( mid~ ; house- ~ )*** .
**an old wive's tale,** نەریت و بیروباوەڕی کۆن و پەڕپووت؛ قسەی پیرێژن.
**take to wife,** هێنان (ژنێکی تایبەتی)؛ مارەکردن:
***( He took a rich girl to wife.)***

**wifehood** (wīf'hood), *n.* ژنێتی.

**wifeless** (wīf'lis), *adj.* بێ ژن.

**wifelike** (wīf'līk'), *adj.* = **wifely.**
*adv.* ژنانە.

**wifely** (wīf'li), *adj.* ژنانە؛ تایبەتی بە ژنی مێردار؛ بۆ ژن شیاو: ***( ~ duties)*** .

**wig** (wig), *n.* بارۆکە؛ کڵاوقژ (هەروەها " peruke ").
*v.t.* (١) کڵاوقژ لەسەرکردن؛ بارۆکە کردنەسەر.
(٢) [British Colloq.]، سەرزەنشتکردن.

**wigan** (wig'ən), *n.* جۆرە قوماشێکی کەتانی ئەستوورە.

**wigeon** (wij'ən), *n.* = **widgeon.**

**wigged** (wigd), *adj.* بارۆکە لەسەر؛ کڵاوقژ لەسەر.

**wiggery** (wig'ẽr-i), *n.* (١) (ا) بارۆکە؛ کڵاوقژ (ب) بارۆکە بەگشتی.
(٢) بارۆکە لەسەرکردن؛ کڵاوقژ لەسەرکردن.

**wiggle** (wig''l), *v.t.* بادان (قنگ)؛ باپیادان؛ سەماپێکردن؛ لەراندنەوە؛ ڕاوەشاندن: ***( to ~ one's toes)*** .
*v.i.* لەرینەوە؛ خۆبادان؛ پێچ بە لەشی خۆدا هێنان (وەك کرمی دەست تێوەدراو).
*n.* باپیادان؛ باخواردن؛ پێچ پێداهاتن؛ لەرە؛ لەرینەوە؛ ڕاوەشان.
**get a wiggle on,** [Slang], پەلەکردن؛ خێراکردن.
**wiggle out of,** خۆکێشانەوە یا ڕزگارکردن؛ خۆ پەڕاندنەوە.

**wiggler** (wig'lẽr), *n.* (١) خۆبادەر (مرۆڤ، گیاندار، شت).
(٢) کرمۆکەی مێشوولە.

**wiggly** (wig'li), *adj.* (١) بە جموجوول؛ خۆبادەر.
(٢) پێچاوپێچ؛ شەپۆلی؛ لوول: ***( a ~ line)*** .
(٣) لەق: ***( a ~ tooth)*** .

**wight** (wīt), *n.* [Archaic], ئادەمیزاد (بەتایبەتی هی بەدبەخت)؛ کەس؛ گیانەوەر؛ دەعبا.

**wight** (wīt), *adj.* [Archaic], (١) ئازا؛ دلێر؛ قارەمان.
(٢) گورج وگۆڵ؛ چوست وچالاك.

**wigwag** (wig'wag'), *v.t.* (١) ڕاوەشاندنی بەیداخ، ڕووناکی... هتد بەپێی شفرەیەکی تایبەتی بۆ پەیام پێ گەیاندن.
(٢) پەیام پێ گەیاندن بەم شێوەیە.
*v.i.* (١) ڕاوەشان؛ هاتن وچوون؛ لەقین.
(٢) دەست ڕاوەشان (بۆ پەیام پێ گەیاندن).
*n.* (١) ڕاوەشانی بەیداخ، ڕووناکی... هتد بۆ پەیام پێ گەیاندن.
(٢) پەیامی بەم شێوەیە ڕاگەیەنراو.

-wigwagger *(n.)*.

**wigwam** (wig′wäm, wig′wôm), *n.* (١) كوختەیەكی قووچكەیی هیندییە ئەمەریكاییەكانە بە پێستەو حەسیرو توێكڵەدار دەوری دەگیرێ.
(٢) [Colloq.]، جێی سەرەدەمی كۆبوونەوەی گشتی.

**wild** (wīld), *adj.* (١) كێوی؛ كێویلە؛ دەشتەكی:
*(~ flowers, animals, etc.)*
(٢) چوڵەوانی؛ چۆڵ؛ دەرودەشت؛ دەشت‌وكێو؛ بەرەڵا: *(~ land)*.
(٣) درندە؛ كێوی: *(~ animals; ~ tribes)*.
(٤) (ا) لاسار؛ سەركێش؛ هاروهاج؛ چەتوون: *(~ children)*.
(ب) تۆر؛ سرك؛ چەمووش.
(٥) بەرەڵا (رەوروشت، كردەوە): *(~ youth; a ~ party)*.
(٦) باوبارانـاوی: *(a ~ seacoast)*.
(٧) (ا) بەبەرۆش؛ بەجۆش؛ وورووژاو: *(~ with delight)*.
(ب) شێتگیر؛ هەڵچوو؛ تووڕە.
(٨) شێواو؛ نارێكوپێك: *(~ hair)*.
(٩) سەیر؛ ناكردەنی؛ ناسایی؛ شێتانە: *(a ~ idea, shceme, etc.)*.
(١٠) هەڵەشە؛ بێباك.
(١١) دوور لە نیشان؛ بەر نیشان نەكەوتوو؛ نەپێكاو.
(١٢) نرخەكەی بە دەست یاریكەرەكەیە (كاغەزێك لە هەندێ یاری‌و قوماردا).
*adv.* بە سەركێشانە؛ بە هەڵەشەیی؛ بە لامسەرلایی؛ شێتانە:
*(He fired ~ .)*
*n. (pl.)*, چۆڵەوانی؛ بیابان؛ دەشت‌ودەر:
*(a safari to the ~s of Africa)*
-wildly *(adv.)*; wildness *(n.)*.
**run wild,** جڵەو نەگیران؛ بەرەڵابوون؛ رێ لێ نەگیران؛ لق‌وپۆپ نەكران؛ بەلەسەبوون:
*(The children are running wild.; The rosebushes run wild.)*
**the wild,** دەشت‌ودەر؛ چۆڵ‌و بیابان؛ چۆڵەوانی:
*(the call of the wild)*

**wild boar,** بەرازە كێوی؛ یەكانە.

**wild carrot,** گێزەری كێوی

**wild-cat** (wīld′kat′), *n. Also* wild cat, (١) پشیلە كێوی
(٢) كەسێكی در؛ كەسێكی دڕندەو سەرگەرم.
(٣) پرۆژەیەكی بازرگانی مەترسی ژێركەوتن لێ كراو.
(٤) بیرە نەوتێكی لێدراو لە شوێنێكدا كە لەوەوپێش بە نەوت نەناسرابێ.
*adj.* (١) شلۆق (بازرگانی)؛ مەترسی ژێركەوتنی لێ دەكرێ (پرۆژەی بازرگانی)؛ دووبەختی: *(a ~ venture)*.
(٢) قەدەغە.
*v.t.* بیرە نەوت لێدان لە ناوچەیەكی بە نەوت نەناسراودا.

**wildcat strike,** مان گرتنی پەسەند نەكراو لەلایەن یەكێتی كرێكارانەوە:
*(The workers went on a ~ .)*

**wildcatter** (wīld′kat′ēr), *n.* (١) بیری نەوت لێدەر لە شوێنی بە نەوت نەناسراودا. (٢) كەسێكە كە خەریكی پرۆژەی دووبەختی، واتە مەترسیدارو فروفێڵاوییە.

**wildebeest** (wil′də-bēst′), *n.* = gnu.

**wilder** (wil′dēr), *v.t.* [Archaic], (١) بەهەڵەدابردن؛ رێ پێ هەڵەكردن. (٢) سەرسوڕماندن.
*v.i.* (١) بە هەڵە چوون؛ رێ هەڵە كردن. (٢) سەرسوڕمان؛ سەرسام بوون.

**wilderness** (wil′dēr-nis), *n.* (١) دەشت‌ودەر؛ چۆڵەوانی؛ كەژوكێو؛ چۆڵ‌و بیابان؛ بیابان؛ دەشت‌و كێو. (٢) كۆمەڵێكی بێ شوماری تێكەڵاوو پێكەڵاوو ئاڵۆز.

**wild-eyed** (wīld′īd), *adj.* (١) چاوبڕ؛ چاوزەق؛ تووڕە؛ شێتگیر؛ هار؛ چاوشێت. (٢) نابەجێ؛ ناكردەنی؛ شێتانە: *(a ~ plan)*

**wildfire** (wīld′fīr′), *n.* (١) ماددەیەكی گرگرە زۆر لە شەڕدا بەكاردەهات. (٢) ئاگری زۆر تەشەنەسەندی دابین نەكراو
(٣) شتی زوو بڵاوبووەوە (قاو، شۆڕش... هتد). (٤) هەورەبرووسكە.
(٥) ignis fatuus # 1.
(٦) [Obs.]، نەخۆشییەكی پێستی مەڕە.

**wild-flower** (wīld′flou′ēr), *n. Also* wild flower, (١) گوڵە كێویلە. (٢) رووەكێكی كێویلەی گوڵدار.

**wild-fowl** (wīld′foul′), *n.* باڵندەی كێوی: بەتایبەتی كەو و قازو سوێسكەو قەتی‌و مراوی كێوی راوكراو.

**wild goose,** قازە كێویلە

**wild-goose chase,** هەوڵی بێ بەر؛ كاری بێ سوودو بێ ئەنجام؛ ئیشی شێت‌و بێ مێشكانە؛ شوێن كڵاوی بابردوو كەوتن.

**wild hyacinth,** گوڵە هاس؛ هاس

**wilding** (wīl′diŋ), *n.* (١) (ا) درەخت یا رووەكێكی كێویلە (بەتایبەتی دارسێو). (ب) سێوە كێویلە. (٢) (ا) گیانداری كێوی.
(ب) كەسێكی كێوی؛ كەسێكی جیاوازو نەگونجاو لەگەڵ دەوروبەرەكەیدا.
*adj.* (١) كێویلە؛ لەخۆوە رووا؛ دەشتەكی. (٢) كێوی؛ ماڵی نەكراو.

**wild land,** زەوی بەرەڵا؛ دەرودەشت؛ چۆڵەوانی؛ چۆڵ‌و بیابان.

**wild-life** (wīld′līf′), *n.* گیاندارو رووەكی كێوی

**wildling** (wīld′liŋ), *n.* رووەك یا گیانداری كێوی (بەتایبەتی رووەكێكی كێویلەی گوێزراوە بۆ ناو باخچە).

**wild madder,** = madder # 1 & 2-A.

**wild mustard,** خەرتەلە كێویلە.

**wild oat ( or oats ),** جۆداس؛ گیاگەنم.
sow one's wild oats, رابواردن بە گەنجی؛ بەر بۆ خۆ بەرەڵاكردن لە گەنجیدا.

**wild rice,** برنجە كێویلە.

**wild turkey,** قەلەموونە كێوی.

**Wild West, wild West,** خۆراوای كێوی: بەشی خۆراوای ئەمەریكا لەپێش ئاوەدانكردنەوەیەوە لەلایەن خەڵكی سپییەوە.

**wild-wood** (wīld′wood′), *n.* دارستانی دەست تێوە نەدراو؛ دارستانی كەس پێدا نەڕۆیشتوو.

**wile** (wīl), *n.* (١) فێڵ؛ فێڵ‌وتەڵەكە؛ مەكر؛ فریو.
(٢) فێڵبازی؛ فێڵ‌وتەڵەكەبازی؛ مەكربازی؛ فریوبازی.
*v.t.* هەڵخەڵەتاندن؛ فێڵ لێكردن؛ فریودان.
wile away, بردنەسەر (بە خۆشی)؛ كات كوشتن:
*(to wile away an afternoon)*

**wilful** (wil′fəl), *adj.* = willful.

**wilily** (wīl′ə-li), *adv.* بە فێڵبازی؛ بە فێڵ‌وتەڵەكەبازی؛ بە زۆڵێتی.

**wiliness** (wīl′i-nis), *n.* فێڵبازی؛ تەڵەكەبازی؛ مەكربازی؛ زۆڵێتی.

**will** (wil), *n.* (١) (ا) ویست؛ حەز؛ مەیل؛ ویستن.
(ب) [Obs.]، چەژ؛ ئارەزوو (خواردن، جووت بوون).
(٢) (ا) خواست؛ داوا؛ حەز؛ خوایشت: *(It is his ~ that you come.)*.
(ب) فەرمان؛ فەرمووده؛ ویست: *(His ~ be done.)*.
(٣) نیاز؛ مەبەست؛ سووربوون لەسەر شتێك؛ زۆر ویستن:
*(where there's a ~ there's a way.)*
(٤) تین؛ چالاكی؛ زەبر: *(He works with a ~ .)*.
(٥) وورە: *(He has a strong ~ .)*.
(٦) بڕیاری خۆ بە دەست خۆ بوون؛ ئازادی بڕیار بۆ خۆ دان:
*(freedom of the ~ )*
(٧) هەڵوێستی بەرامبەر خەڵك: *(I bear her no ill ~ .)*.
(٨) وەسیەتنامە.
*v.t.* (١) ویستن؛ حەزكردن؛ ئارەزووكردن؛ خۆزگە خواستن.
(٢) بڕیاردان؛ سووربوون لەسەر؛ بە هەموو هێزێكەوە ویستن:
*(He ~ed to survive.)*
(٣) فەرمان دان؛ فەرمان دەركردن.
(٤) كارتێكردن (هەر وەك بە هێزی موگناتیسی).

(٥) بۆ بەجێهێشتن لە وەسیەتنامەدا؛ وەسیەت کردن
*v.i.* [Archaic], ویستن؛ حەزکردن
**at will,** بە دڵی خۆ؛ بە هەوەسی خۆ؛ چۆن دەتەوێ و کەی وەها:
***( You may come and go at will.)***
**do the will of,** بەقسەکردن؛ بە گوێ کردن؛ مل بۆ دان.
**will** (wil), *v. aux.* کردارێکی یاریدەدەرە کاتی دواڕۆژ دەگەیێنێ
(ڕێزمان)؛ وە بەم مانایانە بەکاردەهێنرێت:
(١) نیشانەی دواڕۆژ یا کاتی داهاتوو.
***( They ~ arrive tomorrow.; I ~ come later.)***
(٢) مسۆگەری (لە دواڕۆژدا): ***( You ~ regret this.)*** .
(٣) ئامادەیی (یارمەتیدان)؛ حەزکردن؛ توانین:
***( W~ you help me with this?)***
(٤) فەرمان؛ داواکردن: ***( You ~ report to me afterward.)*** .
(٥) خوو ***( She ~ talk for hours on end.)***
(٦) لە تواناد بوون:
***( This metal ~ not crack under heavy pressure.)***
(٧) [Colloq.]. لەوانەبوون؛ بۆ هەبوون؛ ڕەمل لێدان.
***( That ~ be his wife with him, I suppose.)***
*v.i.* ویستن؛ حەزکردن ***( Sit here, if you ~ .)*** .
*v.t.* ئارەزووبوون؛ ویستن؛ حەزکردن: ***( Do what you ~ .)*** .
**willable** (wil′ə-b'l), *adj.* ئەگەر بویسترێ دەکرێ یا دەهێنرێتە دی؛
دەخوازرێ؛ بۆی هەیە بویسترێ و دەست بکەوێ.
**willed** (wild), *adj.* وورەدار ***( strong- ~ ; weak- ~ )*** .
**willemite** (wil′əm-īt′), *n.* ویلمایت کانزایەکی ڕەنگاوڕەنگە.
**willet** (wil′it), *n.* مەلێکی لاق و دەنووک درێژی کەنار ئاوە.
**willful** (wil′fəl), *adj.* *Also* **wilful,** (١) دەسەنقەست.
(٢) کەللەڕەق؛ سەرکێش؛ سەرسەخت؛ قیرسچمە.
**-willfully** *(adv.)*; **willfulness** *(n.)*.
**willies** (wil′iz), *n.pl.* [Slang], هەستی ترس و بێ ئارامی و
ناناسوودە و ناخۆش: ***( This place gives me the ~ .)*** .
**willing** (wil′iŋ), *adj.* (١) ئامادە؛ قایل.
***( I am ~ to go along.)***
(٢) حەزکەر؛ بە خوشی خۆ کراو؛ خۆویست؛ بە دڵ کراو:
***( a ~ participant)***
(٣) تایبەتی بە ئازادی و توانای ڕێبازی خۆ هەڵبژاردن.
**-willingness** *(n.)*.
**willingly** (wil′iŋ-li), *adv.* بە خۆشی خۆ؛ بە حەز و ئارەزووی خۆ نەك
بەزۆر.
**will-o'-the-wisp** (wil′ə-*thə*-wisp′), *n.* (١) ignis fatuus .
(٢) ئاواتی نەهاتەدی؛ خۆ بەهەڵەدابردن؛ سەراو؛ ئاواتی درۆ
**willow** (wil′ō), *n.* (١) بی؛ دارەبی. (٢) داروتەختەی بی.
(٣) [Colloq.]. شتی لە داروتەختەی بی دروستکراو (وەك گورزی بێسبۆل) .
(٤) چەکەرکەوانی هەلاج (بۆ کردنەوەی لۆکە و خوری) .
*v.t.* لۆکە و خوری کردنەوە بە چەکەرکەوان (هەلاجی) .
**willower** (wil′ō-ēr), *n.* (١) چەکەرکەوانی هەلاج. (٢) هەلاج
**willow herb,** ڕووەکێکە گەڵاکەی باریکە وەك هی بی و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ
دەگرێ
**willow oak,** داربەڕوویەکە گەڵاکەی باریکە وەك هی بی.
**willowware** (wil′ō-wâr′), *n.* قاپ و دەوریی نەخشەی دارەبی
لەسەرکراو
**willowy** (wil′ō-i, wil′ə-wi), *adj.* (١) دارەبی زۆر تێدایە؛
بە دارەبی داپۆشراو (٢) لە دارەبی دەچێ؛ شۆخ و قەد باریك؛ جوان و ناسك.
***( a girl with a ~ figure)***
(٣) نەرم؛ بە ئاسانی دەنوشتێتەوە.
**will power,** وورە؛ هێزی بزوێنی ئادەمیزاد؛ هێزی پاڵنەری ناوەکی مرۆڤ.

**willy-nilly** (wil′i-nil′i), *adv.* بەزۆر بێ یا بە خوایشت؛
بتەوێ و نەتەوێ؛ بە هەرحاڵ؛ خۆشی بێ و ترشی بێ:
***( He'll have to do it ~ .)***
*adj.* (١) بەزۆر بێ یا بە خوایشت؛ خۆشی بێ و ترشی بێ. (٢) ڕاڕا؛ دوودڵ.
**wilt** (wilt), *v.i.* (١) سیس بوونەوە (گەڵا، گوڵ... هتد)؛ هەڵقرچان؛
هەڵپرووکان. (٢) هێز لێ بڕان؛ تین تێدا نەمان؛ هەڵپرووکان؛ لە پەل وپۆ کەوتن.
*v.t.* هەڵقرچاندن؛ هەڵپرووکاندن؛ سیس کردنەوە؛ هێز لێ بڕان.
*n.* (١) سیسی؛ هەڵقرچاوی؛ سیس بوونەوە.
(٢) خاوبوونەوە؛ هەوەس نەمان؛ ساردبوونەوە (هەست) .
(٣) نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی سیس بوونەوەی گەڵای ڕووەك.
**wilt** (wilt), *archaic second person sing., present indicative, of* **will.**
**Wiltshire** (wilt′shir), *n.* جۆرە مەڕێکی ئینگلیزی سپی شاخ درێژو
چەماوەیە.
**wily** (wī′li), *adj.* فێڵباز؛ زۆڵ؛ قومارباز؛ تەڵەکەباز؛ مەکرباز؛ ئۆینباز.
**wimble** (wim′b'l), *n.* درەوش؛ ئامێری سمین یا کونکردن.
*v.t.* سمین؛ کونکردن
**wimple** (wim′p'l), *n.* (١) سەرپۆش؛ سەرپۆشی پەرستار.
(٢) (ا) لۆ (جل وبەرگ)؛ توێ؛ لۆچ؛ قەد. (ب) شەپۆلی بچووك. (ج) پێچ.
*v.t.* (١) سەرپۆش لەسەرکردن. (٢) قەدکردن؛ لوول کردن؛ نوشتاندنەوە.
(٣) کەروێشکەپێکردن؛ شەپۆل پێدان.
*v.i.* (١) لوول بوون؛ لۆچ بوون؛ نووشتانەوە. (٢) شەپۆل دان؛ کەروێشکە کردن
**win** (wn), *v.i.* (١) بردنەوە؛ سەرکەوتن.
(٢) سەرکەوتن و گەیشتنە باروذۆخێکی تایبەتی؛ گەیشتنە ئامانج:
***( He won loose from the crowd.)***
*v.t.* (١) لێ هەڵکڕاندن (دەرامەت)؛ دەسکەوتن؛ پەیداکردن (بە هەوڵ و کۆشش)
***( to ~ a living from this sterile land)***
(٢) بردنەوە؛ سەرکەوتن: ***( to ~ a battle, war, game, contest, etc.)*** .
(٣) ( **over** ~ )، ڕاکێشان (لایەنگری):
***( We won him over to our side.)***
(٤) ڕازی کردن بۆ شووپێکردن یا هێنان.
(٥) گەیشتن (شوێن) .
(٦) (ا) کانزاکردن. (ب) کانزای پاك لە هی خاو دەرهێنان.
(ج) ئامادەکردنی کان بۆ کانزاکردن.
*n.* [Colloq.], (١) بردنەوە؛ سەرکەوتن. (٢) قازانج؛ دەسکەوت.
**win the day,** بردنەوە (پێشبڕکێ، شەڕ... هتد)؛ سەرکەوتن.
**wince** (wins), *v.i.* داچڵەکین؛ ڕاچەنین؛ سڵەمینەوە؛ سڵ کردنەوە.
*n.* داچڵەکین؛ ڕاچەنین؛ سڵەمینەوە؛ سڵ کردنەوە؛ سڵ.
**-wincer** *(n.)*.
**winch** (winch), *n.* (١) ئامێری بەرزکەرەوەی شتی قورس.
(٢) هەندل؛ دەسك.
*v.t.* بەرزکردنەوە بە ئامێر.
**wind** (wīnd), *v.t.* (١) هەڵکردن (دەزوو، بەن، شریت)؛ لوول کردن:
***( to ~ thread on a reel)***
(٢) (ا) تێوەپێچان؛ پێچانەوە: ***( to ~ a shawl round a baby)***
(ب) تێوەئاڵاندن.
(٣) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن.
(٤) بە دزییەوە تێخستن؛ بە لاتیل یا خشپە تێخستن:
***( He wound a plea for money into his letter.)***
(٥) بادان: ***( to ~ a crank)*** .
(٦) قوڕمیش کردن: ***( to ~ a watch)*** .
(٧) بەرزکردنەوە بە خولخولۆکە یا سڵنگ.
*v.i.* (١) بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن؛ پێچاوپێچ کردن:
***( The river ~s its way to the sea.)***
(٢) چەوتی نوواندن (ڕەووشت، گفتوگۆ... هتد).

(٣) بە لاتیل یا توانجەوە دەربڕین.

(٤) ( ~ about; ~ around )، تێوەئاڵان؛ پێچ خواردن بە دەوریدا:
( *The ivy ~s around the tree.)*

(٥) خواربوون؛ وەرگەڕان؛ چەوت بوون.

(٦) قورمیش کران؛ باخواردن؛ بادران: *( This clock ~s easily.)* .

(٧) قاچ تێکەوەئاڵان لە ڕۆیشتندا (ئەسپ)؛ پەیزەن بوون.

*n.* (١) هەڵکردن (شریت، دەزوو... هتد)؛ تێوەپێچان.

(٢) پێچ؛ یەك پێچ یا خول (دەزوو، بەن، سارغی، پەت... هتد).

(٣) پێچ (ڕێ)؛ لۆفە؛ چەوتی.

**wind down,** کزبوون؛ بەرەبەرە نەمان؛ کەم بوونەوە.

**wind off,** کردنەوە (شتی پێچراوە یا تێوەئاڵاو) .

**wind up,** (١) هەڵکردن (دەزوو، پەت... هتد).

(٢) کۆتایی پێ هێنان؛ بڕینەوە؛ دوایی پێ هاتن:
*( to wind up one's affairs)*

(٣) هاتنە جۆش؛ وورووژان:
*( He was all wound up before the game.)*

(٤) دەست هەڵهێنانەوە پێش تۆپ هاویشتن (یاری بێسبۆڵ) .

(٥) والێهاتن (بارودۆخ)؛ بەو جۆرە دوایی هاتن.

**wind** (wind; *for n., also poetic* wīnd), ***n.*** (١) با. (٢) بای قایم.

(٣) ڕووی هەڵکردنی با؛ ئەو لایەی بای لێوە هەڵدەکات: *( the four ~s )* .

(٤) بۆن (ڕاو)؛ سروەی بۆنهێنەر. (٥) سووسە؛ دەنگوباسی نهێنی:
*( to get ~ of something; What's in the ~ ?)*

(٦) هەوای پانکەو باوەشێن... هتد.

(٧) هەناسە: *( He got the ~ knocked out of him.)* .

(٨) (ا) قسەی هیچ‌وپووچ؛ قسەی قۆڕو بێ تام.

(ب) فشە؛ خۆهەڵکێشان؛ تڕوفیز. (٩) تڕ؛ تس.

(١٠) ( *pl* )، سازی با؛ ئامێری مۆسیقی بە فوو لێدراو.

*v.t.* (١) خستنەبەر با؛ هەڵخستن لەبەر با؛ ووشك کردنەوە.

(٢) بۆن کردن (ڕاو)؛ شوێن بۆن کەوتن.

(٣) هەناسە لێ بڕین؛ هەناسە سواربوون: *( The run ~ed him.)* .

(٤) پشوو پێدان بۆ هەناسە هاتنەوەبەر (ئەسپ).

**break wind,** تڕکەندن؛ تس کەندن.

**down the wind,** بە هەمان ڕێڕەوی با.

**get ( or have ) wind of,** سووسەکردن؛ دەنگوباسی نهێنی بیستن؛ پێ زانین.

**how the wind blows ( or lies ),** چی باوەو چی باو نییە؛ بیروڕای خەڵك چییەو چی نییە؛ چی باسە.

**in the teeth of the wind,** بەرەو ڕووی با.
(هەروەها " in the wind's eye " ) .

**in the wind,** خەریکە ڕووبدات؛ بە دەستەوەیە؛ بە دزییەوە خۆی بۆ ئامادە دەکرێ‌و خەریکە ئاشکرا دەبێ:
*( There's something in the wind.)*

**into the wind,** بەرەو ڕووی با.

**sail close to the wind,** (١) بەرەو ڕوو یا دژی باوە کەشتی لێخوڕین.
(٢) دەست بە پارەوە گرتن؛ پارە بەفیڕۆ نەدان. (٣) ڕەفتاری ناشرین نواندن.

**take the wind of somebody's sails,** دەستپێشکەری کردن لە ووتن یا کردنی شتێکدا کە کەسێکی تر دەیەوێ بیڵێ یا بیکات‌و ببێتە هۆی پەستکردنی کەسەکە.

**wind** (wīnd, wind), ***v.t.*** (١) لێدان (شمشاڵ، نای...)؛ فووپیاکردن.

(٢) بانگ کردن بە کەرەنا یا زوڕنا لێدان: *( to ~ a rousing call)* .

**windage** (win'dij), ***n.*** (١) جوڵانی هەوا بەهۆی پێداڕۆیشتنی گوللەو شتی وەهادا. (٢) لادانی گوللە لە ڕێڕەوی خۆی بەهۆی باوە؛ ڕادەی ئەم لادانە.

(٣) پلەی گۆڕینی نیشانی چەکی ئاگرین لە بریتی لادانی گوللە لە ڕێڕەوی خۆی بەهۆی باوە.

(٤) بۆشایی نێوان دیواری لوولەی چەکی ئاگرین‌و گوللەکەی ناوی.

(٥) دیوی دەرەوەی کەشتی کە لەبەر بایە.

**windbag** (wind'bag'), ***n.*** [Colloq.], نۆزبلێ؛ زۆروێژ؛ چەنەباز.

**windw**: (١) بابردوو

**wind-blown** (wind'blōn'), ***adj.*** *( ~ dust, sand, leaves, etc.)*

(٢) بەرەو لایەك ڕوواوە بەهۆی بای قایمەوە (داروردەخت) .

(٣) کورت‌و بۆ پێشەوە داهاتوو (قژی ئافرەت) .

**wind-borne** (wind'bôrn', wind'bōrn'), ***adj.*** باهەڵگرتوو (وەك هەندێ هەڵاڵە) .

**windbreak** (wind'brāk'), ***n.*** باشکێن (شوورە، ڕیزە درەخت، پەرژین)؛ باگیر؛ باگر.

**windbreaker** (wind'brāk'ẽr), ***n.*** چاکەتی هەوابڕ؛ چاکەتێکی کورتە هەوای لێوە ناچێ.

**wind-broken** (wind'brō'k'n), ***adj.*** تەنگەهەناسەیی (ئەسپ)؛ تووشی نەخۆشی تەنگەهەناسەیی بووە.

**wind cone,** = **wind-sock.**

**winded** (win'did), ***adj.*** هەناسکەبڕکێ پێکەوتوو؛ هەناسەسوار؛ هەناسە پێ نەماو.

**winder** (wīn'dẽr), ***n.*** (١) پێچەر؛ کرێکاری قوماش پێچەر (لە کارگەدا)؛ لوولکەر. (٢) بەکرەی شت لەسەر هەڵکراو.

(٣) قورمیشی کاتژمێر؛ دوگمەی قورمیش.

(٤) پلەی پێ پلیکانەی پێچاوپێچ.

(٥) ڕووەکی تێوەئاڵاو (وەك لاولاو) .

**windfall** (wind'fôl'), ***n.*** (١) میوەی باخستوو.

(٢) دەسکەوتێکی چاوەڕوان نەکراو؛ دەسکەوتێکی لەلاوەو بەتەمانەبوو؛ شتێکی باشی خوانادروو (بەتایبەتی پارە) .

**windflaw** (wind'flô'), ***n.*** با هەڵکردنی کوتوپڕ.

**windflower** (wind'flou'ẽr), ***n.*** = **anemone.**

**wind-gall** (wind'gôl'), ***n.*** ئاوساوی یا بلۆقی قولەپێی ئەسپ.

**wind gap,** کەلێنی با؛ دەربەندی بچووکی سەر شاخ.

**wind gauge,** پێوەری خێرایی با.

**wind harp,** = **aeolian harp.**

**wind-hover** (wind'huv'ẽr), ***n.*** مشککرە. (ناوەکەی لەوەوە هاتووە کە دەتوانێ بە هەواوە لە جێی خۆیدا بووەستێ) . (هەروەها " kestrel " ) .

**winding** (wīn'diŋ), ***n.*** (١) (ا) ڕێگەی پێچاوپێچ.

(ب) ڕێبازو کردەوەی چەوت. (ج) لوولی؛ لوول خواردن؛ باخواردن؛ لوول بوون.

(٢) (ا) تەل، دەزوو، یا شتی تری هەڵکراوە سەر بەکرە... هتد.

(ب) یەك پێچ یا ئەڵقەی ئەم تەل‌و دەزووە. (ج) شێوەی ئەم هەڵکردنە

(٣) خواری؛ خواربوون؛ چەوتی؛ لاری؛ وەرگەڕان.

(٤) قاچ لەیەکەوەئاڵانی ئەسپ لە کاتی ڕۆیشتندا؛ پەیزەنی.

*adj.* پێچاوپێچ؛ پێچ لوول؛ مارپێچی: *( a ~ road)* .

**winding sheet,** کفن.

**wind instrument,** سازی با؛ ئامێری مۆسیقی بە فوو لێدراو (شمشاڵ، نای).

**wind-jammer** (wind'jam'ẽr), ***n.*** (١) کەشتی با.

(٢) کەشتیوانی کەشتی با.

(٣) [Slang]، کەسێکی نۆزروێژ؛ زۆربلێ؛ هەلەوەڕ.

**windlass** (wind'ləs), ***n.*** ئامێری بەرزکردنەوەی شتی قورس؛ ئامێری لەنگەر هەڵکردن؛ خولخولۆکەی بەرزکەرەوە.

*v.t. & v.i.* بەرزکردنەوە بەم ئامێرە؛ لەنگەر هەڵکردن بەم ئامێرە.

**windle-straw** (win'd'l-strô'), ***n.*** [Scot. or Dial.], (١) پووش؛ پووشکە. (٢) کەسێك یا شتێکی باریك‌و بێ هێز.

**windmill** (wind'mil'), ***n.*** (١) ئاشی با.

(٢) شتێکە لە ئاشی با بکات: (ا) فڕفڕۆکە (یاری منداڵان).

(ب) هێلیکۆپتەر.

**fight ( or tilt at ) windmills,** شەڕ لەگەڵ دوژمنی خەیاڵیدا کردن

(وەك دۆن كيشۆت).

**window** (win′dō), *n.* (١) پەنجەرە
(٢) شووشەی پەنجەرە؛ جامی پەنجەرە: *( He broke the ~ .)* .
(٣) پەنجەرەو چوارچێوەكەی
(٤) كونێكی وەك پەنجەرە (وەك لە هەندێ زەرفدا كە ناونیشانی كەسەكە یا كۆمپانیاكەی لێوە دیارە).
*v.t.* پەنجەرە بۆ كردن؛ پەنجەرە تێخستن.

**window box,** ئینجانەی پەنجەرە: سنوقێكی باریكو درێژە گوڵی تێدا دەروێنرێ و دەخرێتە سەر لێواری پەنجەرە.

**window-dresser** (win′dō-dres′ẽr), *n. Also* window dresser, (١) رازێنەرەوەی پەنجەرەی فرۆشگا بە فرۆتەنی.
(٢) رووكەشكار (ووشەی داهاتوو ببینە).

**window-dressing** (win′dō-dres′iŋ), *n. Also* window dressing, (١) رازاندنەوەی پەنجەرەی فرۆشگا بە فرۆتەنی.
(٢) رووكەشكاری: رووكەش كردنی بارودۆخێك و پیشاندانی تەنها رووی باش و جوانی (بۆ هەڵخەڵەتاندن یا راكێشانی خەڵك).

**window envelope,** زەرفی پەنجەرەدار: زەرفێكە كونێكی تێدایە ناونیشانی ئەو كەسەی لێوە دیارە كە نامەكەی بۆ دەنێررێ.

**window-pane** (win′dō-pān′), *n.* شووشەی پەنجەرە؛ جامی پەنجەرە.

**window screen,** تەلی پەنجەرە

**window shade,** پەردەی پەنجەرە.

**window-shop** (win′dō-shop′), *v.i.* سەیری فرۆتەنی كردن لە جامخانەی فرۆشگادا بێ چوونە ژوورەوەو شت كڕین:
*( Most women like to ~ .)*
-windowshopper *(n.).*

**windowsill** (win′dō-sil′), *n.* لێواری ژێرەوەی پەنجەرە.

**windpipe** (wind′pīp′), *n.* = trachea.

**wind-proof** (wind′proof′), *adj.* بابڕ؛ هەوابڕ؛
هەوای لێوە ناچێتە ژوورەوە: *( a ~ jacket)* .

**wind rose,** نەخشەی رووی هەڵكردنی با و قایمی لە ناوچەیەكدا.

**windrow** (wind′rō′, win′rō′), *n.* (١) ریزە مەلو
(٢) كۆمەڵە كەڵا، پووش‌وپەڵاش، یا بەفری بابردوو و كۆمەڵ كردوو.
(٣) دێراوی قامیشی شەكر تێدا نێژراو.
*v.t.* (١) ریزكردن: كۆمەڵ كردن؛ كەسكدان و كۆكردنەوە.
(٢) قەڵەمی قامیشی شەكر ناشتن.

**windscreen** (wind′skrēn′), *n.* [British]. = windshield.

**windshake** (wind′shāk′), *n.* درزی نێوان ئەڵقەكانی قەدی درەخت بەهۆی بای قایمەوە لە كاتی گەورەبوونی درەختەكەدا.

**windshield** (wind′shēld′), *n.* جامی ئۆتۆمبیل؛ شووشەی پێشی ئۆتۆمبیل.

**windshield-wiper** (wind′shēld-wī′pẽr), *n.* فلچەی ئۆتۆمبیل

**wind sleeve,** = wind-sock.

**wind-sock** (wind′sôk′), *n.* قووچەكەی با: توورەكەیەكی قووچەكیی درێژە دەكرێ بە دارێكەوە بۆ پیشاندانی رووی هەڵكردنی با (لە فڕۆكەخانەو شوێنی تردا) (هەروەها " wind cone " ، " wind sleeve " ).

**Windsor chair,** كورسی ویندزەر: كورسییەكی دارە پشتەكەی بەرزەو لە شیشە دارێ باریك كراوەو پێچكەكانی روویان لە دەرەوەیەو لە خوارەوە بە رایەڵ پێكەوە بەستراون.

**Windsor tie,** بۆینباخی ویندزەر: بۆینباخێكی پانی ئاوریشمە بە گرێ قوڵفەیەكی زل دەبەسترێ.

**wind-spinner** (wind′spi′nẽr), *n.* فرفرۆكە

**wind sprint,** راكردنی بە گوڕ

**windstorm** (wind′stôrm′), *n.* بای زۆر قایم: گەردەلوول؛ گێژەلووكە.

**wind-swept** (wind′swept′), *adj.* بابردوو؛ باهەڵگرتوو؛ با راپێچاو؛ با دەیگرێتەوە.

**wind tee,** بانمایەكە پەرەكانی لە شێوەی تیپی " T " دایە بۆ پیشاندانی رووی هەڵكردنی با (لە فڕۆكەخانەو شوێنی تردا).

**wind-tight** (wind′tīt′), *adj.* = airtight.

**wind tunnel,** تونێلی هەوا: پارەوێكی تونێلییە هەوای تێ دەپەستێنرێ بۆ تاقیكردنەوەی پەستووی با لەسەر نموونەی فڕۆكەو شتی وەها.

**wind-up** (wīnd′up′), *n.* (١) كۆتایی؛ پایان؛ دوایی هاتن؛ دوایی پێ هێنان. (٢) باڵ جوڵاندن و یاری پێ كردن پێش تۆپ هاویشتن (یاری بێسبۆڵ).

**windward** (wind′wẽrd), *n.* روو یا لای با لێوە هەڵكردوو (كەشتیوانی).
*adv.* بەرەو با؛ رووەو با؛ بەرەو رووی با
*adj.* (١) بەرەو رووی با رۆیشتوو. (٢) لەو لایەوە كە با لێوەی هەڵدەكات.

**windway** (wind′wā′), *n.* = flue.

**windy** (win′di), *adj.* (١) باداوی؛ بای هەیە: *( a ~ day)* .
(٢) با دەیگرێتەوە؛ بای زۆرە: *( a ~ city)* .
(٣) لە با دەچێت لە خێرایی و قایمی و هەمیشە گۆڕیندا.
(٤) زۆروێژ؛ زۆربلێ؛ هەڵەوەر؛ دەمەوەر.
(٥) (ا) فشەكەر؛ خۆهەڵكێش؛ فشەباز. (ب) بۆش (قسە).
(٦) (ا) دەبێتە هۆی باوبڕە لە سكدا (وەك نیسكو نۆك... هتد)؛ باوبڕەدار
(ب) باوبڕاوی (سك)؛ قۆرەقۆڕكەر.

**wine** (wīn), *n.* (١) مەی؛ شەراب؛ بادە. (٢) مەستی؛ سەرخۆشی.
(٣) [British]، ئاهەنگی مەی خواردنەوە.
(٤) شەرابی (رەنگ)؛ رەنگی سووری ئەرخەوانی یا توخ.
*v.t.* مەی پێشكەش كردن.
*v.i.* مەی خواردنەوە.

**winebibber** (wīn′bib′ẽr), *n.* شەرابخۆر.

**wine cellar,** (١) ژێرزەمینی شەراب؛ گەنجینەی شەراب.
(٢) ئازووقەی شەراب.

**wine-colored** (wīn′kul′ẽrd), *adj.* شەرابی؛ ئەرخەوانی یا سووری توخ.

**wine-glass** (wīn′glas′, wīn′gläs′), *n.* پەرداخی بادە: پەرداخێكی لاسك درێژە بۆ بادە خواردنەوە كراوە؛ جامی بادە؛ بادە.

**wine-glassful** (wīn′glas-fool′, wīn′gläs-fool′), *n.* پڕ پەرداخێكی بادە؛ پەرداخێك بادە.

**wine-grower** (wīn′grō′ẽr), *n.* شەرابگرەوە؛ شەرابچی؛ رەز پەروەردەكەر بۆ مەی گرتنەوە.

**wine-growing** (wīn′grō′iŋ), *n.* رەز پەروەردەكردن و شەراب گرتنەوە؛ شەراب گرتنەوە.

**wine palm,** جۆرە دارخورمایەكە شەرابی لێ درووست دەكرێ.

**wine-press** (wīn′pres′), *n. Also* wine presser, تەشت یا دەفری ترێ شێلان و گوشین بۆ شەراب گرتنەوە؛ مەكینەی ترێ گوشین بۆ شەراب گرتنەوە.

**winery** (wīn′ẽr-i), *n.* كارگەی شەراب گرتنەوە؛ كارگەی مەی.

**Wine-sap** (wīn′sap′), *n.* (١) جۆرە سێوێكی سووری زستانەی ئەمەریكییە. (٢) درەختی ئەم سێوە.

**wine-shop** (wīn′shop′), *n.* فرۆشگای مەی؛ دووكانی مەی.

**wine-skin** (wīn′skin′), *n.* مەشكەی مەی.

**wine-tasting** (wīn′tās′tiŋ), *n.* مەی تاقیكردنەوە؛ مەی چەشتن بۆ تاقیكردنەوە

**wing** (wiŋ), *n.* (١) باڵ. (٢) باڵی فڕۆكە.
(٣) (ا) بەش (خەستەخانە، فەرمانگە، یا خانووی گەورەی تر)؛ لق؛ دەستە خانوو؛

*( the children's ~ of the hospital; a surgical ~ ; east ~ )*
(ب) تاکێکی دەرگای جووت.
(ج) دیمەنی ئەم لاو ئەولای شانۆ؛ ئەم لاو ئەولای پشتەوەی شانۆ (کە تەماشاکەران نایبینن).
(٤) (ا) لق یا پەلی لەشکرو گەلەکەشتی.
(ب) دەستە (حیزب، پەرلەمان، ڕێکخراو)؛ لق؛ بەش؛ پەل:
*( the left ~ of the party; the right ~ )*
(ج) یاریکەری لای ڕاست یا چەپی گۆڕەپان؛ جێی ئەم یاریکەرانە.
(٥) (ا) پۆلە فڕۆکەی شەڕ.
(ب) ئەو نیشانەیەیە کە فڕۆکەوانی فڕۆکەی جەنگو تاقمەکەی دەیکەن بە سنگیانەوە
(٦) (ا) هۆی فڕین یا گەشت. (ب) فڕین؛ شێوەی فڕین.
(٧) شتێکی بە باڵدار باسکراو: *( on ~s of song)* .
(٨) پەڕەی پەروانەی ئاشی باو پانکە... هتد
(٩) [Colloq.]. باڵی مرۆڤ؛ قۆڵ؛ پەل.
*v.t.* (١) پێدا فڕین؛ بەسەردا یا بەناودا فڕین. (٢) باڵ بۆ کردن.
(٣) باڵ پێ گرتن؛ خێرا ناردن: *( He ~ed his words.)* .
(٤) بە فڕۆکە گواستنەوە.
(٥) باڵ بریندارکردن (باڵندە)؛ باڵ، قۆڵ، یا شان بریندارکردن.
*v.i.* فڕین؛ باڵگرتن.
**on the wing,** لە (کاتی) فڕیندا.
**take wing,** فڕین؛ باڵگرتن؛ هەڵفڕین.
**under the wing of,** لە سایەی؛ لەژێر باڵی؛ لە پەنای؛ لەژێر چاودێری:
*( He took the new members under his wing.)*
**waiting in the wings,** ئامادە؛ چاوەڕێ کردن بە پەرۆشەوە بۆ شتێك:
*( When the president died, many were waiting in the wings to take his place.)*
**wing and wing,** بایەوانی هەردوولا هەڵکراون
**wing chair,** کورسییەکی بەرگدارە پاڵپشتەکەی بەرزەو تەختێك لەم لاو ئەولای کورسییەکەیشی گرتووەتەوە.
**winged** (wiŋd), *adj.* (١) باڵدار؛ باڵندە. (٢) بەرز.
(٣) (ا) خێرا؛ تیژڕەو. (ب) فڕندە. (٤) (ا) باڵ بریندار.
(ب) [Colloq.]، باڵ بریندار (مرۆڤ)؛ قۆڵ بریندار
**wing-ding** (wiŋ′diŋ), *n.* [Slang], ئاهەنگو زەماوەند.
**wing-footed** (wiŋ′foot′id), *adj.* تیژڕەو؛ خێرا.
**wingless** (wiŋ′lis), *adj.* بێ باڵ؛ باڵدارە بەڵام ناتوانێ بفڕێ (وەك مریشكو هەندێ باڵندەی تر).
**winglet** (wiŋ′lit), *n.* باڵی بچکۆلە.
**wing-like** (wiŋ′lik′), *adj.* باڵ ئاسا؛ لە باڵ دەچێ.
**wing shot,** (١) تەقەی لە باڵندەی فڕیو کراو.
(٢) نیشانچی باڵندە بە ئاسمانەوە
**wing-span** (wiŋ′span′), *n.* درێژی باڵی فڕۆکە یا باڵندە لە نووکی ئەم باڵەوە بۆ نووکی ئەو باڵ
**wing-spread** (wiŋ′spred′), *n.* = **wing-span.**
**wingy** (wiŋ′i), *adj.* (١) باڵدار؛ باڵندە. (٢) فڕندە؛ تیژڕەو؛ خێرا.
(٣) بەرز؛ بڵند. (٤) باڵ ئاسا؛ لە باڵ دەچێ.
**wink** (wiŋk), *v.i.* (١) چاو ترووکاندن؛ چاو قووچاندنو کردنەوە.
(٢) چاو-اگرتن. (٣) درەوشانەوە؛ بریسکانەوە؛ پرشنگدانەوە.
*v.t.* (١) چاو ترووکاندن؛ چاو قووچاندنو کردنەوە. (٢) چاو لێ داگرتن.
*n.* (١) چاو ترووکان؛ ترووکەی چاو؛ چاو قووچانو کردنەوە.
(٢) ترووکە؛ هەناسە؛ چرکە؛ کاتێکی زۆر کەم؛ چاو قووچانێك.
(٣) سەرخەو؛ قنگەخەو؛ کەروێشکەخەو *( not a ~ )* .
(٤) چاو داگرتن. (٥) درەوشە؛ بریسکە؛ پرشنگ
**forty winks,** [Colloq.]. قنگەخەو؛ سەرخەو؛ کەروێشکە خەو
**wink at,** (١) چاو لێ نووقاندن؛ چاو لێ پۆشین:
*( He winked at corruption in his ministry.)*
(٢) چاو لێ داگرتن.
**winker** (wiŋk′ēr), *n.* (١) چاوقووچێنەر؛ چاوترووکێنەر.
(٢) سەرکەللە؛ چاوبەستی ئەسپی گالیسکە.
(٣) [Colloq.]، (ا) چاو. (ب) برژانگ.
**winkle** (wiŋ′k'l), *n.* پێنج پێچۆکەی دەریایی؛ هێلکە شەیتانۆکەی دەریا
**winnable** (win′ə-b'l), *adj.* دەبرێتەوە: *( a ~ war)* .
**winner** (win′ēr), *n.* براوە (پێشبڕکێ، یاری... هتد)؛ سەرکەوتوو.
**winning** (win′iŋ), *adj.* (١) براوە:
*( the ~ team, candidate, side, etc.)*
(٢) سەرکەوتوو؛ جوانو ڕێكوپێك؛ بەبرەو: *( a ~ personality)* .
*n.* (١) بردنەوە؛ سەرکەوتن. (٢) *(pl.)* ، شتی براوە (بەتایبەتی پارە).
(٣) بەشێکی تازە کراوەی کانە خەڵووز.
**winnow** (win′ō), *v.t.* (١) شەن کردن (گەنموجۆ)؛ سووورکردن (خەرمان).
(٢) پەرشوبڵاوکردنەوە: *( the wind ~ed the leaves.)* .
(٣) پاكوپیس کردن؛ لە بێژنگدان؛ چاكو خراپ لێك جیاکردنەوە:
*( to ~ truth from falsehood)*
(٤) باڵەفڕێ کردن؛ شەقە لە باڵ هەڵساندن.
*v.i.* (١) شەن کردن؛ خەرمان سوورکردن. (٢) فڕین.
*n.* (١) شەن کردن. (٢) شەن.
**winnower** (win′ō-ēr, win′ə-wēr), *n.* (١) شەنکەر. (٢) شەن.
**wino** (win′ō), *n. pl.* winoes, winos, [Slang], هەمیشە مەست؛ عەرەق خۆر؛ هەمیشە سەرخۆش
**winsome** (win′səm), *adj.* دڵرفێن؛ دڵ ڕاکێش؛ جوان.
*( a ~ smile)*
-winsomely *(adv.)*; winsomeness *(n.)*.
**winter** (win′tēr), *n.* (١) زستان؛ وەرزی زستان.
(٢) ساڵ: *( a man of eighty ~s )* .
(٣) سەردەمی نشوستی، بەناخداچوون، تاریکی، ناخۆشی.
*adj.* زستانی؛ زستانە: (ا) لە زستاندا کراو: *( ~ sports)* .
(ب) لە زستاندا پێگەییو *( ~ apples)* .
(ج) لە زستاندا چێنراو: *( ~ wheat)* .
*v.i.* زستان بردنە سەر: *( They ~ in the south.)* .
*v.t.* هێشتنەوەو بەخێوکردن: *( ~ing the sheep in the stable.)* .
-winterer *(n.)*; winterless *(adj.)*.
**winterberry** (win′tēr-ber′i), *n.* شیلان.
**winterbourne** (win′tēr-bôrn′, win′tēr-bōrn′), *n.* کوێرە چەم: جۆگەیەکە لە زستاندا ئاوی پیا دەڕواتو لە هاویندا ووشك دەکات
**winterfeed** (win′tēr-fēd′), *v.t.* ئالف دان (بە ئاژەڵ) لە زستاندا.
**winterize** (win′tēr-īz′), *v.t.* ئامادەکردن بۆ زستان (ئوتومبیل، خانوو).
**winter-kill** (win′tēr-kil′), *v.t.* ڕووەك کوشتن (سەرما).
*v.i.* لە سەرمادا مردن (ڕووەك).
*n.* لە سەرمادا مردن.
**winterly** (win′tēr-li), *adj.* = **wintry.**
**winter melon,** کاڵەکە زستانە.
**winter solstice,** ڕۆژگەڕانەوەی زستان. (ووشەی " solstice " ببینە).
**winter squash,** کوولەکە زستانە: کوولەیەکی خڕو بچووکی توێکڵ ئەستوورە.
**wintertide** (win′tēr-tīd′), *n.* [Archaic or poetic], = **wintertime.**
**wintertime** (win′tēr-tīm′), *n.* وەرزی زستان؛ زستان.
**wintery** (win′tēr-i, win′tri), *adj.* = **wintry.**
**wintry** (win′tri), *adj.* (١) زستانی؛ سارد: *( ~ weather)* .

(۲) دڵتەنگکەر؛ ناخۆش؛ خەفەتاوی.

(۳) ساردوسڕ؛ سارد: *( a ~ smile, greeting, etc.)* .

-**wintrily** *(adv.)*; **wintriness** *(n.)*.

**winy** (wīn′i), *adj.* شەرابی (تام، ڕەنگ... هتد)؛ مەستکەر؛ سەرخۆشکەر

**winze** (winz), *n.* ڕاڕەوی لێژ یا لوولەی ستوونی نێوان دوو چینی کانگە.

**winze** (winz), *n.* [Scot.], لەعنەت.

**wipe** (wīp), *v.t.* (۱) سڕین؛ پاکردنەوە؛ ووشك كردنەوە (دەست، دەفر): *( to ~ a table, one's hands, etc.)*

(۲) ( ~ off; ~ out )، لێکردنەوە: *( W~ the dirt off your shoes.)* .

(۳) لێدان؛ لێخستن؛ چەورکردن: *( W~ the oil into the surface.)* .

(٤) ( ~ from )، سڕینەوە؛ لابردن؛ نەهێشتن. *( to ~ a thought from one's mind)*

(٥) دارشتنەی لەحیم لێدان؛ لەحیم کردن.

*n.* (۱) سڕین؛ پاکردنەوە؛ ووشك كردنەوە (لەش).

(۲) لێدان؛ پیامالین؛ پیادان. (۳) [Colloq.]، توانج؛ پلار.

(٤) [Slang]، دەسەسڕ.

**wipe off,** سڕین؛ سڕینەوە؛ لابردن؛ گسك لێدان؛ مالین؛ کوژاندنەوە (بە تەختەسڕ... هتد)

**wipe out,** (۱) سڕینەوە؛ پاکردنەوە.

(۲) قەلاچۆکردن؛ لەناوبردن؛ بنەبڕکردن؛ هیچ نەهێشتن؛ کوشتن.

**wiper** (wip′ēr), *n.* (۱) پاککەرەوە.

(۲) خاولی؛ دەسەسڕ؛ شتی بۆ ووشك كردنەوەو سڕین بەکارهێنراو (وەك فلچەی جامی ئوتومبیل... هتد).

**wire** (wīr), *n.* (۱) تەل؛ وایەر؛ سیم

(۲) پارچەیەك تەلی کارەبا، ژێی ئامێری مۆسیقا... هتد.

(۳) تەلکاری (٤) تەلی تەلەفۆن، تەلبەند، داو... هتد

(٥) برووسکە؛ تەل *( Reply by ~ )* .

(٦) هێلی تەواوبوونی غارغارێن

*adj.* تەل؛ وایەر؛ لە تەل دروستکراو.

*v.t.* (۱) بە تەل پێکەوە بەستن؛ تەل لێدان.

(۲) تەلە بۆ نانەوە؛ داو بۆ نانەوە. (۳) تەلی کارەبا بۆ ڕاکێشان.

(٤) [Colloq.]، برووسکە لێدان؛ تەل لێدان.

*v.i.* [Colloq.], برووسکە لێدان؛ برووسکە ناردن؛ تەل لێدان

**get under the wire,** بە ئاستەم فریاکەوتن؛ بە ئاستەم پێداگەیشتن.

**pull wires,** لە ژێرەوە دەسەلاتی خۆ بەکارهێنان و کارکردنەسەر خەلك بۆ هێنانەدی مەبەستی خۆ (هەر وەك یاری کردن بە بووکە سەماکەرە).

**wire cloth,** تەلی هێلەك (بۆ شت پالاوتن و بێژانەوە... هتد).

**wire cutter,** پلایس؛ تەلبڕ

**wired** (wīrd), *adj.* (۱) بە تەل قایم کراو

(۲) تەلی (کارەبا یا تەلەفۆن) بۆ ڕاکێشراوە.

(۳) دەورەکەی بە تەل پێچراوەتەوە

(٤) تەلبەند کراوە؛ شوورەی تەلی بۆ کراوە

(٥) بەستراوە بە کۆمپیوتەری ترەوە

(٦) [Slang]، دەمارگرژ؛ شێتگیر؛ هاتووەتە جۆش.

**wire-dancer** (wīr′dan′sēr, wīr′dän′sēr), *n.* تەنافباز

**wire-draw** (wīr′drô′), *v.t.* (۱) کانزا ڕاکێشان و تەل لێ دروستکردن.

(۲) درێژکردنەوە (۳) زۆر ووردکردنەوە (باس)؛ زۆر بە ووردی لێکۆڵینەوە.

**wire entanglement,** تەلبەند

**wire guage,** تەل پێوەر؛ ئامێری پێوانی تیرەی تەل و ئەستووری تەبەقە ئاسن

**wire gauze,** برنجۆکی تەل؛ شانەی تەلی زۆر باریکی وەك تەلی هێلەك.

**wire grass,** گیایەکی لاسك زبرو ڕەقە وەك تەل

**wire-hair** (wīr′hâr′), *n.* سەگێکی ڕاوی تووك ڕەق و زبرە وەك تەل (هەروەها " wire-haired terrier ") .

**wire-haired** (wīr′hârd′), *adj.* تووك ڕەق و زبر وەك تەل

**wireless** (wīr′lis), *adj.* بێ تەل؛ تەلسز.

*n* (۱) بێ تەل؛ تەلسز. (۲) تەلەفۆنی بێ تەل.

(۳) [Chiefly British]، ڕادیۆ.

*v.t. & v.i.* تەلسز بۆ کردن؛ پەیوەندی پێوەکردن بە بێ تەل.

**wireless telegraphy,** تەلەگرافی بێ تەل.

**wireless telephone,** تەلەفۆنی بێ تەل.

**wireman** (wīr′mən), *n.* تەلساز؛ کارگەری تەلی تەلەفۆن و کارەبا. (هەروەها " lineman ") .

**wire netting,** تەلی تەنراو.

**wire-puller** (wīr′pool′ēr), *n.* (۱) تەل ڕاکێشی بووکی سەماکەرە.

(۲) کەسێکە کە لەژێرەوە دەسەلاتی خۆی بەکاردەهێنێ بۆ کارکردنەسەر خەلك و بەجێهێنانی مەبەستی خۆی.

-**wire-pulling** *(n.)*.

**wirer** (wīr′ēr), *n.* (۱) wireman .

(۲) ڕاوکەر بە تەلە؛ کەسێکە تەلە دەنێتەوە.

**wire recorder,** تەل تۆمارکەر. (لە پێش داهاتنی شریتەوە بەکاردەهێنرا).

**wire rope,** تەنافی تەل؛ گوریسی تەل

**wiretap** (wīr′tap′), *n.* (۱) ئامێرێکە بۆ بە دزییەوە گوێ لێگرتن و تۆمارکردنی تەلەفۆنی خەلك. (۲) دانانی ئامێرێکی وەها لەسەر تەلەفۆنی کەسێك (کە دەتوانرێ لە دوورەوە بکرێ).

*v.t.* (۱) دانانی ئامێری بە دزییەوە گوێگرتن لە تەلەفۆن: *( to ~ a telephone)*

(۲) بە دزییەوە گوێ لێ گرتن و تۆمارکردنی گفتوگۆی سەر تەلەفۆنی خەلك *( to ~ telephone conversations)*

*v.i.* دانانی ئامێری بە دزییەوە گوێگرتن لە تەلەفۆن.

*adj.* تایبەتی بە بەدزییەوە گوێگرتن لە گفتوگۆی سەر تەلەفۆن.

-**wiretapper** *(n.)*; **wire-tapping** *(n.)*.

**wirework** (wīr′wûrk′), *n.* (۱) تەلکاری؛ تەلسازی؛ نیشوکاری تەل.

(۲) (ا) شتی لە تەل دروستکراو؛ شتومەکی تەل. (ب) تەلی تەنراو.

**wireworks** (wīr′wûrks′), *n.pl.* کارگەی تەل؛ کارخانەی تەلسازی.

**wireworm** (wīr′wûrm′), *n.* (۱) کرمی تەلی: کرمۆکەی هەندێ قالۆنچەیە لەژێر خاکدا دەژی و ڕەگی ڕووەك دەخوات. (۲) هەزارپێ.

**wiring** (wīr′iŋ), *n.* (۱) تەلکاری (کارەبا، تەلەفۆن)؛ نیشی تەل.

(۲) سەرجەمی تەلەکانی شوێنێك (وەك هی کارەبای ماڵێك یا خانوویەك).

*adj.* هی تەلکاری؛ هی تەل و نیشی تەل.

**wiry** (wīr′i), *adj.* (۱) تەلی؛ وایەری؛ تایبەتی بە تەل.

(۲) لە تەل دەچێ (لە چۆنێتی و شێوەدا)؛ ڕەق *( ~ hair)* .

(۳) باریك و قایم و ماسولکەدارو بەهێز (مرۆڤ، گیانەوەر).

(٤) هی تەل لەرینەوە: *( a ~ sound)*

-**wirily** *(adv.)*; **wiriness** *(n.)*.

**wis** (wis), *v.t.* [Archaic], زانین؛ وا زانین؛ وا دانان

**wisdom** (wiz′dəm), *n.* (۱) ژیری؛ ژیرێتی؛ ئاقلی.

(۲) زانست؛ زانیاری؛ زانایی؛ زانین: *( the ~ of the ages)* .

(۳) [Rare]، پەند؛ قسەو کرداری ژیرانە

**wisdom tooth,** ددانی ژیری

**wise** (wīz), *adj.* (۱) ژیر؛ ئاقل (۲) زانا؛ دانا؛ تێگەیشتوو

(۳) زیرەك؛ زرنگ؛ زۆرزان (٤) بە ئاگا؛ ئاگادار؛ شارەزا.

(٥) ژیرانە؛ بەجێ؛ دروست. *( a ~ move, action, saying, etc.)*

(٦) [Slang]، زۆر لەخۆبایی (بەتایبەتی کەسێك کە وا خۆی دەردەخات کە هەموو شتێك دەزانێ)؛ خۆ بە زیرەك دانەرو بە تەوسەوە قسەکەرو خەلك پەستکەر

**be ( or get ) wise to,** [Slang], پێ زانین؛ بۆ دەرکەوتن (شتی نهێنی) *( to get wise to a fraud)*

**get wise,** [Slang], (۱) فێربوون؛ تێگەیشتن

(٢) بە تەوسەوەو بە لەخۆبایی بوونەوە قسەکردن و ڕەفتار نواندن:
***(Don't get wise with me, young man!)***
**put someone wise (to),** [Slang], پێ ووتن (شتی نهێنی یا نەزانراو)؛ فێرکردن؛ چاوکردنەوە.
**wise up,** [Slang], (١) فێرکردن؛ پێ ووتن:
***(They wised him up to it.)***
(٢) فێربوون؛ تێگەیشتن؛ ڕاستی بۆ دەرکەوتن:
***(to wise up to a fact, situation, etc.)***
**wise** (wīz), *n.* شێوە؛ جۆر: | ***in no (some, any, such) ~*** |.
**-wise** (wīz), پاشگرێکە بەمانای: (ا) بار (لە باری پانی، درێژی... هتد)؛ شێوە: ***(sidewise, lengthwise, anywise)***.
(ب) بە شێوەی؛ ئاسا؛ وەك: ***(clockwise)***.
(ج) دەربارەی؛ لە بابەت: ***(weathewise, budgetwise)***.
**wiseacre** (wīz'ā'kēr), *n.* = **smart aleck; wise guy.**
**wise-crack** (wīz'krak´), *n.* [Slang], قسەی بە توێکڵ؛ قسە، وەڵام، تێبینی، یا نوکتەیەکی بە توێکڵ و بە تەوسەوە؛ لاپلار؛ پلار.
*v.i.* [Slang], قسەی بە توێکڵ کردن؛ وەڵامی بە تەوسەوە دانەوە؛ نوکتەی بە توێکڵ و پڕ لە توانج گێڕانەوە؛ پلار هاویشتن.
**-wisecracker** *(n.)*.
**wise guy,** کەسێکی لەخۆبایی (بەتایبەتی یەکێك کە وا خۆی دەردەخات کە هەموو شتێك دەزانێ)؛ کەسێکی خۆ بە زیرەك دانەر و بە تەوسەوە قسەکەر و خەڵك پەستکەر (هەروەها " **wiseacre** ").
**wisely** (wīz'li), *adv.* ژیرانە؛ بە ژیری؛ دانایانە؛ تێگەیشتووانە.
**wisenheimer, weisenheimer,** = **wiseacre.**
**wisent** (wīz'n't), *n.* = **aurochs # 2.**
**wish** (wish), *v.t.* (١) حەزکردن؛ ئارەزووکردن؛ ویستن:
***(I ~ to know.)***
(٢) ئاوات خواستن؛ ئاواتەخواز بوون؛ خۆزگە خواستن:
***(I ~ the week were over.)***
(٣) داوا بۆ کردن؛ هیوا وا بوون بۆ (باش یا خراپ):
***(I ~ you good luck.)***
(٤) لێ کردن (سڵاو، خواحافیزی، ڕۆژباش... هتد):
***(She ~ed me good morning.)***
(٥) داوالێکردن؛ فەرمان پێ کردن؛ پێ ووتن: ***(I ~ you to leave.)***.
(٦) ( **~ on** )، بەسەردا دان؛ سەپاندن بەسەردا:
***(another duty ~ed on him.)***
*v.i.* (١) ( **~ for** )، ویستن؛ حەزکردن؛ ئارەزووکردن؛ داواکردن:
***(to ~ for the moon)***
(٢) ئاوات خواستن؛ ئاواتەخواز بوون؛ خۆزگە خواستن.
*n.* (١) حەز؛ ئارەزوو.
(٢) خواست؛ خۆزگە؛ خوایشت؛ داخوازی؛ ئاواتی دڵ؛ ئاوات؛ هیوا:
***(She got her ~ finally.)***
(٣) داوا؛ ویست؛ فەرمان؛ داواکاری: ***(It is her ~ that you go.)***.
(٤) (*pl.*)، ئاواتەخوازی؛ هیوای خۆشی و چاکی و سەرکەوتن:
***(They send their ~es.)***
**wishbone** (wish'bōn´), *n.* چەڵەمە؛ ئێسقانی چەڵەمە.
**wishful** (wish'fəl), *adj.* ئاواتەخواز؛ هیوادار؛ خۆزگەخواز؛ ئارەزوومەند
**-wishfully** *(adv.)*; **wishfulness** *(n.)*.
**wish fulfillment,** ئاوات هاتنەدی؛ خۆزگە هاتنەدی.
**wishful thinking,** خەیاڵی خاو؛ خۆزگەیەکە کە لەوانە نییە بێتەدی
**wish-wash** (wish'wôsh´, wish'wäsh´), *n.* خواردنەوەی ڕوون و بێ تام
**wishy-washy** (wish'i-wôsh´i, wish'i-wäsh´i), *adj.* (١) ڕوون؛ ڕوون و بێ تام (٢) ڕاڕا؛ دوودڵ؛ حوڵحوڵ؛ بێ بار

**wisp** (wisp), *n.* (١) قول (گیا، گەنم، جۆ)؛ چەپك.
(٢) کاکۆڵ: ***(a ~ of hair)***.
(٣) کاغەز یا پووشی لوول کراو (بۆ ئاگر داگیرساندن):
***(Use a ~ of hair to light the fire.)***
(٤) (ا) کەسێك یا شتێکی باریکەلە: ***(a ~ of a girl)***.
(ب) شتێکی بە ئاستەم دیار: ***(a ~ of a smile, frown, etc.)***.
(ج) تاڵە دووکەڵ، هەور، یا تەم: ***(a ~ of smoke, cloud, etc.)***
(٥) **will-o'-the-wisp**.
(٦) [Archaic]، **whisk broom**.
*v.t.* لوول کردن (وەك کاغەز یا پووش... هتد)؛ لوول دان.
**wispy** (wisp'i), *adj.* باریکەلە؛ تەنك؛ ناسك؛ بە ئاستەم دیار؛ لاواز.
**wist** (wist), *past tense and past participle of* **wit.**
**wisteria** (wis-têr'i-ə), *n. Also* **wistaria,** ڕووەکێکی خۆهەڵواسە لە کۆمەڵەی پاقلە گوڵی سپی و شین و پەمەیی و ئەرخەوانی جوان دەگرێت.
**wistful** (wist'fəl), *adj.* خۆزگەخواز (بە کزۆڵەیی و خەمباری و پەرۆشەوە)؛ کزۆڵە؛ ئاواتەخواز بە نائومێدییەوە؛ ئومێدەوار بە پەرۆشەوە؛ مات و بە پەرۆش: ***(~ eyes; a ~ expression on her face.)***.
**-wistfully** *(adv.)*; **wistfulness** *(n.)*.
**wit** (wit), *n.* (١) مێشك.
(٢) (*pl.*)، (ا) زیرەکی؛ توانای بیرکردنەوەو تێگەیشتن؛ بە مێشکی
(ب) ژیری؛ ئاقڵی. (٣) [Rare]، بە سەلیقەیی.
(٤) قسەی قوت؛ قسەی نەستەق.
(٥) قسەی قوت یا نەستەق زانین؛ دانایی؛ قسەزانی (بەتایبەتی هی خۆش و سەیرو قوت... هتد). (٦) قسەی قوت کەر؛ قسەزان (بەتایبەتی هی خۆش و سەیرو قوت و نەستەق)؛ قسەخۆش و نەستەق.
**at one's wits' end,** نازانێ چی بکا یا بڵێ؛ مێشکی لەسەردا نەماوە؛ هۆشی لای خۆی نەماوە.
**keep ( or have ) one's wits about one,** هۆشی لای خۆ مان و تێك نەچوون (بەتایبەتی لە تەنگ و چەڵەمەدا)؛ سەر لێ تێك نەچوون.
**live by one's wits,** بە فێڵ و فەرەج ژیان.
**out of one's wits,** مێشك لەسەردا نەماو (لە تووڕەیی یا لە ترسدا)؛ شێت.
**wit** (wit), *v.t. & v.i.* [Archaic], زانین؛ فێربوون؛ پێ زانین
**to wit,** واتا؛ واتە.
**witan** (wit'ən), *n.* (١) ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی پاشای ئینگلیز (مێژووی ئینگلیزی کۆن) (٢) ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە.
**witch** (wich), *n.* (١) جادووگەری ژن؛ جادووباز (ئافرەت).
(٢) پیرێژنە سەر ئاسنینە؛ پیرێژنێکی ناشرینی تووڕەوتیژ.
(٣) [Colloq.]، ژنی دڵڕفێن؛ کچێکی زۆر جوان.
*v.t.* (١) نوشتەلێکردن؛ جادووبەن لێکردن.
(٢) بە جادووگەری کردن یا هێنانە دی. (٣) دڵڕفاندن.
**witchcraft** (wich'kraft´, wich'kräft´), *n.* (١) جادووگەری؛ جادووبازی؛ ئەفسونگەری. (٢) دڵڕفاندن؛ شێت و شەیدا کردن.
**witch doctor,** جادووباز؛ جادووگەر؛ پزیشکی جادووباز. (هەروەها " **medicine man** "، " **shaman** ").
**witchery** (wich'ēr-i), *n.* = **witchcraft.**
**witches'-broom** (wich'iz-broom´, wich'iz-broom´), *n.* تۆپەڵە وەچی سەر لق و قەدی درەخت (کە لە کەڕووەوە پەیدادەبێ و زیانبەخشە).
**witch grass,** جۆرە گیایەکی تووکنە
**witch hazel,** (١) دەوەنێکی گوڵ زەردی بەر دارینە.
(٢) شلەیەکی کحولییە لە گەڵا و توێکڵە داری ئەم دەوەنە دەگیرێ
**witch hunt,** بەدووکەوتن و بیانوو پێ گرتن و چەوساندنەوەی نارەوایانەی ئەوانەی گومانی نادڵسۆزی و ناپاکیان لێ دەکرێ بەرامبەر بە میری یا دەزگایەك.
**-witchhunter** *(n.)*; **witchhunting** *(adj. & n.)*.
**witching** (wich'iŋ), *n.* = **witchcraft.**

***adj.*** (١) هی جادووبازی؛ تایبەتی بە جادووگەری: ***(the ~ hour)*** .
(٢) دڵرفێن؛ شێتوشەیداکەر.

**witch moth,** پەپوولەی شەوگەڕ.

**wite** (wīt), ***n.*** (١) (ا) سزای پارە (ب) مز.
(٢) [Scot.]. سووچ؛ خەتا

***v.t.*** تاوانبارکردن؛ خەتابارکردن؛ گوناهبارکردن.

**witenagemot, witenagemote** (wit′ə-nə-gə-mōt′), ***n.***
ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی پاشای ئینگلیز لە کۆندا؛ ئەنجوومەن یا کۆڕی نیشتمانیی ئەنگلۆساکسۆنی. (هەروەها " **witan** ") .

**with** (wi*th*,with), ***prep.*** (١) دژ؛ دژ بە؛ لەگەڵ؛ بەرامبەر:
***( He argued and fought ~ his wife.)***
(٢) بە تەنیشت؛ لە نزیک
(٣) لەگەڵ ***( Mix it ~ water.)***
(٤) لەگەڵ ***( He talked and played ~ her.)*** .
(٥) لەلای؛ لەژێر چاودێری: ***( Leave the children ~ grandmother.)*** .
(٦) لە؛ لەی: ***( She was pleased ~ her gift.)*** .
(٧) لەگەڵ ***( She is friendly ~ strangers.)*** .
(٨) وەك؛ وەکو (لە باشێتیو لێ زانیندا): ***( She sings ~ the best.)*** .
(٩) (ا) لەگەڵ (هاوڕایی، لایەنگری): ***( Are you ~ me or against me?)*** .
(ب) لەگەڵ (لایەنگری): ***( He voted ~ us.)*** .
(١٠) بەلای؛ لەلای؛ لای: ***( Whatever you decide is all right ~ me.)*** .
(١١) لە؛ بەهۆی ***( She was faint ~ hunger.)*** .
(١٢) بە: ***( Stir ~ a spoon.)*** .
(١٣) (ا) بە ***( He said it ~ confidence.)*** .
(ب) بە ***( W~ your permission, I'll go.)*** .
(١٤) بەوەوە (هەبوون): ***( the man ~ a moustache)*** .
(١٥) بە: ***( He plays ~ skill.)*** .
(١٦) و؛ وە ***( The woman, ~ her two daughters, arrived.)*** .
(١٧) لەگەڵ ئەوەشدا؛ لەگەڵ:
***( W~ all this talent, he could not get a job.)***
(١٨) (ا) لەگەڵ؛ لە هەمان کاتدا: ***( to rise ~ the chickens.)*** .
(ب) لەگەڵ؛ بۆ هەمان لا: ***( to travel ~ the sun)*** .
(ج) بەپێی؛ بەگوێرەی؛ هەروەك؛ لەگەڵ: ***( to grow wise ~ age)*** .
(١٩) پێکەوە؛ بە ***( Join this end ~ that.)***
(٢٠) لە (جیابوونەوە):
***( to part ~ one's family, friends, gains, etc.)***

**be ( or get ) with it,** [Colloq.], ئاگاداربوونی دوا مۆدەو شتی وەها؛ زانینی شتی باوی ناو کۆمەڵ:
***( His friends say he is not quite with it.)***

**in with,** تێکەڵاو لەگەڵ؛ کۆك؛ لەگەڵدا هەڵسانو دانیشتن؛ لەگەڵدا بوون:
***( He is in with the wrong crowd.)***

**with that,** یەکسەر دوای ئەوە؛ ئیتر:
***( With that she departed.)***

**withal** (wi*th*-ôl′, with-ôl′), ***adv.*** (١) هەروەها؛ زیاد لەوەیش.
(٢) لەگەڵ ئەوەشدا؛ لە لایەکی ترەوە؛ لە سەرێکی ترەوە.

***prep.*** [Archaic], بەوە

**withdraw** (wi*th*-drô′, with-drô′), ***v.t.*** (١) کێشاندنەوە (لەشکر؛ کشاندنە دواوە؛ لابردن؛ ڕاکێشان (پارە لە بانق)؛ لێ دەرهێنان.
(٢) پاشگەزبوونەوە؛ کێشاندنەوە: ***( to ~ a statement, an offer, etc.)*** .

***v.i.*** (١) کشانەوە (لەشکر)؛ کشانە دواوە.
(٢) تەکینەوە؛ خۆکشانەوە؛ دوورەپەرێزی کردن

**withdrawal** (wi*th*-drô′əl, with-drô′əl), ***n.*** (١) (ا) کشانەوە؛ کشانە دواوە (ب) پەیوەندی بڕین یا کەمکردنەوە؛ تەکینەوە.
(ج) ڕاکێشان (پارە لە بانق)؛ دەرهێنان
(٢) (ا) بڕان (هەمیشە خواردنو شتی وەها)؛ وازهێنان؛ خۆکێشانەوە (هیرۆین، حەشیشە... هتد). (ب) نیشانەکانی ئەم وازهێنان یا خۆکێشانەوەیە کە دیاری دەدات لەو کەسە.

**withdrawing room,** [Archaic], = **drawing room.**

**withdrawment** (wi*th*-drô′mənt, with-drô′mənt), ***n.*** = **withdrawal.**

**withdrawn** (wi*th*-drôn′, with-drōn′), ***adj.*** گۆشەگیر؛ تەریك؛ شەرمن؛ دوورەپەرێز.

**with** (wi*th*, with, wīth), ***n.*** توولی جیڕ (بۆ شت پێ بەستن وەك پەت).

***v.t.*** بەستن بە توول یا شوولی جیڕ.

**wither** (wi*th*′ẽr), ***v.i.*** (١) سیس بوونەوە؛ هەڵقرچان؛ ووشك بوونەوە؛ پووکانەوە؛ هەڵپڕووکان؛ داکەوتن. (٢) کزبوون؛ کەم بوونەوە (هەست، خۆشەویستی).

***v.t.*** (١) هەڵقرچاندن؛ هەڵپڕووکاندن؛ پووکاندنەوە؛ ووشك کردنەوە
(٢) ووشك کردن (ترس)؛ سڕکردن: ***( He ~ed her with a look.)***

**withered** (wi*th*′ẽrd), ***adj.*** سیس؛ هەڵقرچاو؛ هەڵپڕووکاو؛ پووکاوە؛ هەڵکڕووزاو.

**witherite** (wi*th*′ẽr-īt′), ***n.*** جۆرە کانزایەکی هەمەڕەنگە.

**withers** (wi*th*′ẽrz), ***n.pl.*** ناوشانی ئەسپو ووڵاخی تر.

**withershins** (wi*th*′ẽr-shinz′), ***adv.*** [Scot.], (١) بە پێچەوانەی (ڕێڕەو، ڕوو). (٢) بە پێچەوانەی (ڕێڕەوی) خۆرەوە.

**withhold** (with-hōld′, wi*th*-hōld′), ***v.t.*** ( **p.t. withheld** ), (١) ڕاگرتن؛ وەستاندن؛ ڕاگیرکردن؛ هێشتنەوە؛ گرتن.
(٢) پێ نەدان؛ دریغی (لێ) کردن؛ نەدان:
***( to ~ payment, information, one's consent, etc.)***

***v.i.*** خۆ ڕاگرتن؛ ڕێ بە خۆ نەدان؛ نەکردن.

**withholding tax,** باجی گیراو یا لێ بڕاو: ئەو باجەیە کە مانگ بە مانگ لە دەسکەوتی مووچەخۆران دەبڕڕێو ئەدرێ بە میری (لە کۆتایی ساڵدا ئەگەر مووچەخۆرەکە هێشتا هەر باجی لەسەر مابوو ئەوا دەیداتو ئەگەر زیادەیشیان لێ بڕیبوو بۆی دەگەڕێننەوە).

**within** (wi*th*-in′,with-in′), ***adv.*** (١) لە ناوەوە؛ لەناو.
(٢) لە ماڵەوە؛ لە ژوورەوە: ***( Is Mr. Smith ~ ?)*** .
(٣) ناوەکی؛ هەناوی؛ لەناو لەش، مێشك، دڵ، یا ویژداندا؛ لە دڵەوە.

***prep.*** (١) لەناو: ***( to be safe ~ walls)*** .
(٢) (ا) کەمتر لە؛ لە ماوەی؛ لە مەودای؛ لەناو؛ لە:
***( ~ five miles; ~ an hour; ~ sight; ~ reach)***
(ب) لە؛ لە مەودای: ***( ~ my experience)*** .
(٣) لە سنووری: ***( ~ the law)*** .

**withindoors** (wi*th*-in′dôrz′, with-in′dōrz′), ***adv.*** = **indoors.**

**without** (wi*th*-out′,with-out′), ***adv.*** (١) لە دەرەوە.
(٢) دەرەوە؛ لە دەرەوەی ماڵ.

***prep.*** (١) بۆ دەرەوە؛ لە دەرەوە.
(٢) دوور لە؛ دوورتر لە؛ نایگاتێ: ***( ~ his reach)*** .
(٣) بەبێ؛ بێ: ***( ~ food and water)*** .
(٤) بێ؛ بەبێ: ***( ~ fear, doubt, etc.)*** .
(٥) بێ؛ بەبێ: ***( He passed ~ speaking.)***
(٦) بێ (نەبوونی)؛ بەبێ (شتێکی لەوەوپێش ناوبراو): ***( We went ~ .)*** .

***conj.*** [Dial.], ئەگەر وا نەبێ؛ مەگەر.

**do ( or go ) without,** هەڵکردن بەبێ؛ گوزەران کردن بەبێ:
***( to do without money, food, medicine, etc.)***

**withoutdoors** (wi*th*-out′dôrz′, with-out′dōrz′), ***adv.*** = [Archaic], **outdoors.**

**withstand** (with-stand′,wi*th*-stand′), ***v.t. & v.i.*** بەرگەگرتن؛ خۆ لەبەردا ڕاگرتن؛ بەرهەڵستی کردن.

**withy** (wi*th*′i, with′i), ***n.*** (١) توولی جیڕو نەرم (بۆ شت پێ بەستن).

(هەروەها " **with** ") . (۲) گوریس یا پەتی درووستکراو لەم توولانە.
(۳) دارێکە توولی وەها چیری لێ دەبڕرێتەوە (وەك بی)
*adj.* (۱) چیرو نەرم (وەك توولەدار).
(۲) چیر (مرۆڤ)؛ بەکێش؛ بەهێز؛ بەرگەگر
**witless** (wit′lis), *adj.* بێ مێشك؛ کەر؛ هیچ نەزان.
**-witlessly** *(adv.)*; **witlessness** *(n.)*.
**witling** (wit′liŋ), *n.* کەسێکی خۆ بە تێگەیشتوو دانەر.
**witness** (wit′nis), *n.* (۱) گەواهی؛ شایەتی.
(۲) (ا) گەواه؛ شایەت (دادگا). (ب) شایەت؛ کەسێکە کە ئامادەی ڕووداوێك بووبێ و چاوی تێوە بووبێ. (۳) شایەت (بۆ ئیمزاکردنی بەڵگەنامەیەك).
(٤) بەڵگە؛ نیشانە (بۆ ساغ کردنەوە).
*v.t.* (۱) گەواهی دان؛ شایەتی دان. (۲) بەڵگە بوون بۆ؛ شایەتی بوون بۆ.
(۳) بوون بە شایەت (ئیمزاکردنی بەڵگەنامەیەك).
(٤) بینین (ڕوودان)؛ ئامادەبوون لە شوێنی ڕووداوێکدا:
***( to ~ an accident)***
(٥) بینین (مەجاز): ***( This hill has ~ed many battles.)*** .
*v.i.* بەڵگە بوون بۆ؛ شایەتی بوون بۆ.
**bear witness,** بەڵگە بوون بۆ؛ شایەتی بوون بۆ؛ شایەتی دان:
***( This destruction bears witness to their cruelty.)***
**witness box,** [British], = **witness stand.**
**witness stand,** کورسی شایەت (لە دادگادا)؛ جێی گەواه.
**witted** (wit′id), *adj.* . ***( slow- ~ )*** :تێگەیشتوو؛ نەوەندە تێگەیشتووە
**witticism** (wit′ə-siz′m), *n.* قسەی قوت؛ قسەیەکی دانایانە؛ نوکتە؛ وتەیەکی خۆش
**witting** (wit′iŋ), *adj.* (۱) ئاگادار؛ بەئاگا (۲) دەسەنقەست.
**-wittingly** *(adv.)*.
**wittol** (wit′'l), *n.* پیاوێکە کە بە داوێن پیسی ژنەکەی دەزانێ و چاوی لێ دەپۆشێ (وشەی " **cuckold** " ببینە) .
**witty** (wit′i), *adj.* (۱) قوت (وتە)؛ نەستەق؛ خۆش و سەیر:
***( a ~ remark)***
(۲) قسە قوت؛ قسە نەستەق؛ قسە خۆش؛ زمان خۆش: ***( a ~ person)*** .
(۲) [Obs. or Dial.]، زیرەك.
**-wittily** *(adv.)*; **wittiness** *(n.)*.
**wive** (wīv), *v.i.* ژنهێنان
*v.t.* (۱) ژنهێنان. (۲) ژن بۆ هێنان؛ ژن لێ مارەکردن.
**wivern, wyvern** (wī′vērn), *n. Also* **wiver,** ئەژدیهای خەیالی: دەعبایەکی باڵداری دوو لاقی کلك دڕکاوی خەیاڵییە لەسەر درووشمی سوارچاکی یا خانەدانی دەنەخشێنرێ.
**wives** (wīvz), *n. plural of* **wife.**
**wiz** (wiz), *n.* [Slang], *Also* **whiz,** کەسێکی بلیمەت (لە ڕشتەیەکدا)؛ کەسێکی زۆر لێهاتوو. ***( He's a ~ at chemistry.; a computer ~ )*** .
**wizard** (wiz′ērd), *n.* (۱) جادووگەر؛ جادووباز.
(۲) کەسێکی بلیمەت؛ کەسێکی زۆر زیرەك و کارامە و لێهاتوو.
(۳) [Obs.]، پیرێکی دانا و ژیرو تێگەیشتوو.
*adj.* (۱) تایبەتی بە جادووگەران و جادووگەری.
(۲) [British Slang]، نایاب؛ زۆر باش و خۆش.
**wizardly** (wiz′ērd-li), *adj.* (۱) وەك جادووگەر؛ جادووگەری؛ جادووبازانە. (۲) زۆر سەیرو نایاب.
**wizardry** (wiz′ērd-ri), *n.* (۱) جادووگەری؛ جادووبازی؛ ئەفسوون.
(۲) هێزێکی نائاسایی.
**wizen** (wiz′'n), *v.i.* هەڵقرچان؛ وشك بوونەوە؛ هەڵپرووکان؛ سیس بوونەوە
*v.t.* هەڵقرچاندن؛ وشك کردنەوە؛ پووکاندنەوە.
*adj.* = **wizened.**
**wizened** (wiz′'nd), *adj.* هەڵقرچاو؛ سیس؛ وشك؛ پووکاوە.

**woad** (wōd), *n.* (۱) وسمە: گیایەکە گەڵاکەی وسمەی لێ دەگیرێ بۆ قژ ڕەش کردنەوە. (۲) وسمە.
**woadwaxen** (wōd′wak′s'n), *n.* = **woodwaxen.**
**wobble** (wob′'l), *v.i. Also* **wabble,** (۱) بە لارەولار ڕۆیشتن (وەك مراوی)؛ بە خلەخل ڕۆیشتن؛ گەڵاوگەڵ ڕۆیشتن؛ لەنگین.
(۲) لەقین؛ لەقان. (۳) لەرینەوە؛ لەرزان؛ لەرانەوە.
(٤) ڕاڕا بوون؛ دوودڵ بوون؛ دوودڵی کردن.
*v.t.* لەراندنەوە؛ لەقاندن.
*n.* (۱) لارەولارکردن لە ڕۆیشتندا؛ خلەخل. (۲) لەرانەوە؛ لەرینەوە
(۳) لەقین؛ لەقان. (٤) لەرزۆکی دەنگ.
**wobbly** (wob′li), *adj.* . ***( a ~ table, chair, desk)*** لەق؛ لەرزۆك
**woe** (wō), *n. Also* **wo,** (۱) ماتەمینی؛ خەم و خەفەت؛ خەمباری؛ ئاخ و داخ: ***( a tale of ~ )*** .
(۲) لێقەومان؛ کارەسات؛ ناخۆشی؛ بەدبەختی؛ وەی:
***( poverty, illness, and other ~s.)***
*interj.* هاوار بەماڵم!؛ قوڕ بە سەرم!؛ قوڕ بە سەری!
**in weal and woe,** لە خۆشی و ناخۆشیدا
**woebegone, wobegone** (wō′bi-gôn′), *n.* (۱) ماتەمین؛ مات؛ خەمبار؛ غەمگین: ***( a ~ appearance)*** .
(۲) [Archaic]، لێقەوماو؛ ڕەنجەڕۆ؛ پەرێشان؛ کوڵۆل.
**woeful** (wō′fəl), *adj. Also* **woful,** (۱) جێی دڵ پێ سووتانە؛ خەم و خەفەتاوی؛ ناخۆش؛ بەدبەخت؛ کوڵۆل: ***( Hers is a ~ situation.)*** .
(۲) زۆر خراپ؛ جێی داخە:
***( ~ ignorance; a ~ collection of paintings.)***
**-woefully** *(adv.)*; **woefulness** *(n.)*.
**wok** (wok), *n.* تاوەیەکی قووڵی خڕە خواردەمەنی تێدا سوور دەکرێتەوە. (بەتایبەتی لە لێنانی خواردەمەنی چینیدا بەکاردەهێنرێ) .
**woke** (wōk), *alternative past tense of* **wake.**
**woken** (wō′kən), *rare past and past participle of* **wake.**
**wold** (wōld), *n.* دەشتێکی ڕووتی بەرز.
**wold** (wōld), *n.* = **weld.**
**wolf** (woolf), *n.* (۱) گورگ.
(۲) (ا) کەسێکی دڕندە و چاوبرسی و زیانەخۆرو بێ سفەت و دڵڕەق.
(ب) [Slang]، مێباز.
(۳) کرمۆکەی سووس و جانەوەری تر کە دەداتە دانەوێڵە.
(٤) ناسازی ئاوازی مۆسیقا.
*v.t.* ماشینەوە؛ هەڵ لووشین؛ بە پەلە خواردن؛ زۆر خواردن؛ لرف لێدان.
**a wolf in sheep's clothing,** گورگە و لە پێستی مەڕدایە؛ دوژمنی خۆ بە دۆست پیشاندەر.
**cry wolf,** بە درۆ هاوارکردن؛ دەم بە هاوار بوون.
**keep the wolf from the door,** برسێتی دوورخستنەوە لە ماڵی خۆ.
**wolfberry** (woolf′ber′i), *n.* دەوەنێکە بەری سپی دەگرێ.
**wolf dog,** گورگە سەگ: (ا) توخمە سەگێکی گەورەی نێرلەندییە ڕاوە گورگی پێ دەکرا. (ب) سەگێکی دوورەگە ڕەگێکی گورگ و یەکێکی سەگ؛ سەگی گورگ ئاسایی.
**wolf-fish** (woolf′fish′), *n.* گورگە ماسی: ماسییەکی زل دڕە.
**wolf-hound** (woolf′hound′), *n.* گورگە سەگ: توخمە سەگێکی گەورەیە ڕاوە گورگی پێ دەکرا.
**wolfish** (wool′fish), *adj.* گورگی؛ دڕندە؛ بەزیان؛ زیانەخۆر؛ چاوبرسی.
**-wolfishly** *(adv.)*.
**wolf pack,** (۱) گەلە گورگ.
(۲) کۆمەڵێك ژێردەریایی پێکەوە پەلاماری کاروانی دەریایی دوژمن دەدەن.
(۳) دوو سێ فڕۆکەی جەنگی پێکەوە هێرش دەبەن.
**wolfram** (wool′frəm), *n.* (۱) **tungsten** . (۲) **wolframite** .

**wolframite** (wool′from-īt′), *n.* کانزایەکی قاوەیی یا ڕەشکەڵەیە

**wolfsbane** (woolfs′bān′), *n.* گورگ خنکێن ژەهری گورگ

ڕووەکێکی دەشتەکی ژەهرینە گوڵی سپی و شین و زەرد دەگرێ دەرمان لە ڕەگەکەی دەگیرێ. (هەروەها " aconite " ، " monkshood ").

**wollastonite** (wool′əs-t′n-īt′), *n.* کانزایەکی سپییە

**wolver** (wool′vēr), *n.* گورگ ڕ وکەر

**wolverine** (wool′və-rēn′, wool′və-rēn′), *n.* (١) گیاندارێکی ئەمەریکی گۆشتخۆری شیردەری تیسک درێژی تۆکمەیە لە توخمی دەڵەك. (هەروەها " glutton ")

(٢) [W-] [Colloq.]، نیشتەنیییەکی ویلایەتی " مشیگەن " ی ئەمەریکییە.

**wolves** (woolvz), *plural of* **wolf.**

**woman** (woom′ən), *n.* (*pl.* **women**), (١) ژن؛ ئافرەت؛ مێ

(٢) کارەکەر (٣) (أ) هاوسەر؛ ژن؛ خێزان (ب) دڵدار؛ دۆست؛ یار؛ دەنك.

(٤) پیاوی (سەر) ژنانی

(٥) مێیەتی؛ سرووشتی ژنێتی *(It's the ~ in her)*.

*adj.* (١) مێچکە؛ مێ؛ تایبەتی بە ژن؛ ژنانە

(٢) مێ؛ ئافرەت؛ ژن: *(a ~ scientist)*

**woman-chaser** (woom′ən-chā′zēr), *n.* womanizer.

**womanhood** (woom′ən-hood′), *n.* (١) ژنێتی

(٢) خوو و ڕەووشتی ژنانە؛ خوو و ڕەووشتی لە ژن هاتوو.

(٣) ژن گەل؛ ژنان؛ ژن بەگشتی؛ ئافرەتان.

**womanish** (woom′ən-ish), *adj.* (١) ژنانە؛ مێیانە؛ مێچکانە؛ لە ژن هاتوو؛ ناسك. (٢) ژنانی؛ سەر ژنانی؛ کچانی.

**womanize** (woom′ən-īz′), *v.t.* وەك ژن لێکردن؛ سرووشتی ژن پێدان.

*v.i.* مێبازی کردن؛ داوێن پیسی کردن.

**womanizer** (woom′ən-īz′ēr), *n.* مێباز؛ داوێن پیس

**womankind** (woom′ən-kīnd′), *n.* ژنان؛ ئافرەتان؛ ژن گەل؛ ژن؛ توخمی ژن؛ ڕەگەزی ژن؛ ژنان بەگشتی.

**womanlike** (woom′ən-līk′), *adj.* ژنانە؛ وەك ژن؛ لە ژن هاتوو.

**womanly** (woom′ən-li), *adj.* (١) مێیانە؛ ژنانە؛ وەك ژن.

(٢) لە ژن هاتوو؛ بە ئابڕوو؛ سەلار؛ شەرمن: *(~ modesty)*.

**-womanliness** *(n.).*

**woman of the house,** = lady of the house.

**woman of the street(s),** = prostitute; street-walker.

**woman suffrage,** مافی ژنان بۆ دەنگدان (لە هەڵبژاردنی گشتیدا) (هەروەها " female suffrage ").

**-woman-suffragist** *(n.).*

**womb** (wōōm), *n.* (١) منداڵدان؛ تیزانگ؛ سك (منداڵ بوون). (هەروەها " uterus ").

(٢) شوێنی شت تێدا پەروەردە بوون یا پێکهاتن: *(The ~ of time)*.

(٣) ناوی ناوەوەی شت (٤) [Obs.]، سك؛ وورگ.

**wombat** (wom′bat), *n.* گیاندارێکی کیسەداری زەوی هەڵکەنی ئوستورالییە لە وورچی بچووك دەچێ

**women** (wim′in), *n. plural of* **woman.**

**women-folk** (wim′in-fōk′), *n.pl Also* **womenfolks. women; womankind.**

**women's rights, woman's rights,** مافی ژنان؛ مافی ئافرەتان

**won** (wun), *past tense and past participle of* **win.**

**won** (wun, woon, wōn), *v.i.* [Archaic], نیشتەجێ بوون؛ مانەوە

**wonder** (wun′dēr), *n.* (١) شتێك، کەسێك، یا ڕووداوێکی سەیر: *(Television is one of the ~s of modern science.)*

(٢) سەرسامی؛ سەرسووڕمان؛ واق وڕمان؛ سەیر پێ هاتن.

(٣) موعجیزە

*v.i.* (١) سەر سووڕمان؛ سەرسام بوون؛ سەیر لێ هاتن.

(٢) گومان (لێ) بوون؛ تیا ڕامان؛ تیا مان.

*v.t.* گومان (لێ) بوون؛ تیا ڕامان؛ تیا مان: *(I ~ why he came.)*.

**-wonderer** *(n.).*

**for a wonder,** سەیرە؛ زۆر سەیرە.

**( it is ) no wonder ( that ),** (شتێکی) سەیر نییە؛ بۆیە

**I wonder,** (١) ئاخۆ. (٢) بڕوا ناکەم؛ گومانم هەیە؛ بە گومانم.

**wonderful** (wun′dēr-fəl), *adj.* (١) سەیر؛ مایەی سەرسامییە؛ سەر دەسوڕمێنێ. (٢) نایاب؛ زۆر خۆش؛ زۆر باش: *(a ~ person, meal, holiday, place, house, time, etc.)*

**-wonderfully** *(adv.)*; **wonderfulness** *(n.).*

**wonderland** (wun′dēr-land′), *n.* (١) شوێنێکی خەیاڵی؛ شوێنێکە ناهێنرێتە بەرچاو. (٢) شوێنێکی زۆر خۆش و جوان و سەیر.

**wonderment** (wun′dēr-mənt), *n.* (١) سەرسامی؛ سەر سووڕمان؛ سەیر لێ هاتن. (٢) شتێکی سەیر؛ شتێکی سەرسوڕمێنەر یا سەرسامکەر

**wonder-stricken** (wun′dēr-strik′n), *adj.* سەرسوڕماو؛ واق وڕماو؛ سەرسام.

**wonder-struck** (wun′dēr-struk′n), *adj.* = wonder-stricken.

**wonderwork** (wun′dēr-wūrk′), *n.* (١) کارێك یا شتێکی سەیر. (٢) موعجیزە.

**-wonder-worker** *(n.)*; **wonder-working** *(adj.).*

**wondrous** (wun′drəs), *adj.* = **wonderful.**

*adv.* سەرئاسایانە؛ بە ڕادەیەکی سەیرو سەرسوڕمێنەر.

**wonky** (woŋ′ki), *adj.* [British Slang], شلۆق؛ لاواز؛ لەق.

**wont** (wunt, wōnt, wônt), *adj.* ڕاهاتوو؛ خوو پێوە گرتوو؛ فێر: *(He was ~ to sleep early and rise early.)*

*n.* خوو؛ نەریت: *(He came home much later than was his ~ .)*.

*v.i.* ڕاهاتن؛ خوو پێوە گرتن؛ وا فێربوون.

**won't** (wōnt), = **will not.**

**wonted** (wun′tid, wōn′tid, wôn′tid), *adj.* (١) باو؛ ئاسایی (٢) ڕاهاتوو؛ خوو پێوەگرتوو؛ هۆگر؛ فێر.

**woo** (wōō), *v.t.* (١) دڵداری لەگەڵ کردن؛ خوازبێنی کردن؛ دڵ خواستن؛ دڵفڕاندنی ژن؛ خۆشەویستی پیشاندان (بە نیازی هێنان).

(٢) هەوڵ بۆ دان؛ کۆشش بۆ کردن؛ دواکەوتن: *(She ~ed fame and money.)*

(٣) تکالێکردن؛ لێ پاڕانەوە؛ ماستاو بۆ کردن؛ هەوڵی پێ سەلماندن دان.

*v.i.* (١) دڵداری لەگەڵ کردن؛ دڵ خواستن (بۆ خوازبێنی کردن).

(٢) تکاکردن؛ پاڕانەوە؛ هەوڵدان بۆ پێ سەلماندن.

**wood** (wood), *n.* (١) (*pl.*) ، دارستان؛ بێشە؛ بێشەڵان؛ جەنگەڵ.

(٢) دار؛ ئەو بەشەی درەخت کە ڕەقە (وەك قەدو لقەکانی).

(٣) داروتەختە.

(٤) داری سووت؛ گزرە؛ دارگزرە؛ داری سووتاندن. (هەروەها " firewood ")

(٥) شتی دارین: (أ) کەموڵە؛ بەرمیلی شەراب... هتد: *(wine aged in ~ )*.

(ب) تەختەی داری شت لەسەر لەتکردن (وەك هی قەساب).

(ج) ئامێری مۆسیقی دارین

*adj.* (١) دارین؛ لە دار درووستکراو. (٢) هی دار بڕینەوەو ڕێك وپێك کردن.

(٣) دارستان نشین: لە دارستاندا ڕوواو یا ژیاو

*v.t.* (١) دار ناشتن. داری سووتەنی بۆ هێنان

*v.i.* داری سووتەنی هێنان.

**be unable to see the wood for the trees,** نەبینینی شتی گرنگ لەبەر هی ووردو ناگرنگ؛ هەڵسەنگاندنی گشتی بارودۆخێك بۆ نەکران لەبەر بایەخدان بە ووردەشت.

**in the wood,** لە بەرمیلدایە (مەی).

**out of the woods,** [Colloq.], لە مەترسی ڕزگاری بووە؛ ئیتر لە مەترسی دەرچووە؛ لە خەم ڕەخسیو.

**wood** (wood), *adj.* [Archaic or Dial.], (١) شێت
(٢) زۆر تووڕە؛ قوشقی.

**wood alcohol,** = methanol.

**wood anemone,** گولاڵە

**woodbin** (wood′bin′), *n.* سنووقی داری سووتەنی.

**woodbine** (wood′bīn′), *n.* جۆرە ڕووەکێکە لە توخمی یاسەمین.

**wood block,** (١) کوتەرە دار
(٢) (ا) کلێشەی هەڵکەنراو لەسەر دار (چاپەمەنی).
(ب) وێنەی دەرهێنراو لەسەر ئەم کلێشەیە.

**wood-borer** (wood′bôr′ẽr), *n.* مێرووی دارکونکەرو دارخۆر.

**wood-carving** (wood′kärv′iŋ), *n.* (١) دار هەڵکەندن؛ نەخش لەسەر دار هەڵکەندن. (٢) پەیکەر یا شتێکی وەها دروستکردن لە دار.

-woodcarver *(n.).*

**wood-chat** (wood′chat′), *n.* باڵندەیەکە لە توخمی ڕیشۆڵە.

**wood-chuck** (wood′chuk′), *n.* مشکی دەشت: گیاندارێکی کرۆژەندەیە لە توخمی سمۆرە. (ووشەی " marmot " ببینە).
(هەروەها " ground hog ").

**wood coal,** (١) خەڵووزی دار (٢) lignite .

**wood-cock** (wood′kok′), *n.* (١) باڵندەیەکی دەنووک درێژی مام ناوەندی‌یە لە توخمی قوڕاویلکە.
(٢) [Obs.] کەسێکی ساویلکەو بێ مێشک.

**woodcraft** (wood′kraft′, wood′kräft′), *n.* (١) کارامەیی و چالاکی لە دارستان و دەشت‌ودەردا (وەك ڕاوکردن).
(٢) نیشی دار؛ شت دروستکردن لە دار.

**woodcut** (wood′kut′), *n.* (١) پارچە داری کلێشە لەسەر هەڵکەنراو.
(٢) وێنەی ئەم کلێشەیە.

**woodcutter** (wood′kut′ẽr), *n.* دارکەر

**wooded** (wood′id), *adj.* دارستاناوی: دارودرەختاوی.

**wooden** (wood′′n), *adj.* (١) دارین: لە دار دروستکراو.
(٢) ووشك؛ ڕەق؛ بێ هەستانە: *( a ~ smile, stare, etc.)* .
(٣) بێ مێشك؛ کەودەن؛ کەر: *( ~ - head)* .

**wood engraving,** (١) پارچە داری نەخش لەسەر هەڵکەنراو.
(٢) دار هەڵکەندن: نەخش لەسەر دار هەڵکەندن.
(٣) وێنەی لەسەر ئەم نەخشە وەرگیراو. (ووشەی " woodcut " ببینە).

-wood-engraver *(n.).*

**wooden-head** (wood′′n-hed′), *n.* [Colloq.], کەسێکی کەرو بێ مێشك.

**wooden-headed** (wood′′n-hed′id), *adj.* [Colloq.], کەر؛ بێ مێشك: کەودەن.

**wooden horse,** = Trojan horse # 1.

**woodenware** (wood′′n-wâr′), *n.* دەفری دارین؛ قاپ و قاچاخی دار.

**wood hyacinth,** هاسی کێوی.

**wood ibis,** باڵندەیەکی قەراغ ئاوە لە حاجی لەقلەق دەکات.

**woodland** (wood′land′), *n.* دارستان؛ زەوی دارودرەخت و دەوەناوی
*adj.* (١) دارستانی؛ تایبەتی بە دارستان.
(٢) لە دارستاندا ژیاو یا ڕوواو.

-woodlander *(n.).*

**wood lark,** باڵندەیەکی دەنگ خۆشە لە توخمی کلاوکورە.

**wood lot,** پەڵە زەوی دار تێدا ڕوێنراو بۆ برینەوە.

**wood louse,** ئەسپێی دار: خلێرە؛ مێروویەکی بچووکە لە خاکی شێدارو لەناو داری ڕزیودا دەژی. (هەروەها " sow bug " ، " pill bug " ) .

**woodman** (wood′mən), *n.* (١) [ Chiefly Bri.] ، دارستانەوان؛ کارگێڕی دارستان. (٢) دارکەر.
(٣) دارستان نشین؛ مرۆڤی لە دارستاندا ژیاو.
(هەروەها " woodsman " ) .

**wood-note** (wood′nōt′), *n.* خوێندنی مەلی ناو دارستان.

**wood nymph,** (١) بووکی دارستان (ئەفسانە). (هەروەها " dryad " )
(٢) جۆرێکە لە ( " hummingbird " ) .
(٣) پەپوولەی دارستان.

**wood-pecker** (wood′pek′ẽr), *n.* دارکونکەرە.

**wood pigeon,** (١) کۆتری خەت لە مل؛ کۆتری خاڵ لە مل.
(٢) کۆترە کێوی‌یە خۆراوای ئەمەریکایە.

**woodpile** (wood′pīl′), *n.* لێژنەدار.

**wood pulp,** تلپەی دار (بۆ کاغەز دروستکردن) .

**wood rat,** = pack rat.

**woodshed** (wood′shed′), *n.* کەپری داری سووتەنی.

**woodsman** (woodz′mən), *n.* (١) دارکەر.
(٢) (ا) دارستانەوان. (ب) دارستان نشین. (٣) ڕاوکەری ناو دارستان
(٤) وەستای شتی دارین دروستکردن؛ شتی دارین دروستکەر.
(هەروەها " woodman " ) .

**wood sorrel,** ترشۆکە: گیایەکی کێویلەیە گەڵاکەی لە سلق دەچێ و ترشە گوڵی سپی و سوورو ئەرخەوانی و زەرد دەگرێ.

**wood spirit,** = methanol.

**woodsy** (wood′zi), *adj.* دارستانی؛ لە دارستان دەچێ؛ وەك دارستان.

**wood tar,** قەترانی دار.

**wood thrush,** ڕیشۆڵەی دارستان: باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی ڕیشۆڵە.

**wood-turning** (wood′tũr′niŋ), *n.* خەڕاتی دار: شتومەك لە دار دروستکردن.

-wood-turner *(n.).*

**wood-waxen** (wood′wak′s′n), *n.* بنچکێکی گوڵ زەردە جاران ڕەنگی زەردی لێ دەگیرا.

**wood wind,** (١) سازی بای دارین؛ ئامێری مۆسیقی بای دارین.
(٢) *(pl.)*، سازی بای دارینی سازو سەمتوورنك (ئۆرکێسترایەك) بەگشتی.

**wood-work** (wood′wũrk′), *n.* (١) دارتاشی؛ نیشی دار.
(٢) شتومەکی دارین (بەتایبەتی هی ناو خانوو وەك دەرگاو لێواری پەنجەرەو پێ پلیکانەو ئەردە... هتد).

-woodworker *(n.).*

**wood-working** (wood′wũr′kiŋ), *n.* دارتاشی؛ نیشی دار.
*adj.* هی دارتاشی: *( ~ tools)* .

**wood-worm** (wood′wũrm′), *n.* کرمی دار.

**woody** (wood′i), *adj.* (١) دارستاناوی؛ دارو درەخت و دەوەناوی.
(٢) دارکی؛ داری؛ وەك درەخت ڕەقە: *( ~ plants)* .
(٣) [Rare]، دارستانی؛ تایبەت بە دارستان. (٤) لە دار دەچێ.

-woodiness *(n.).*

**wooer** (wōō′ẽr), *n.* داواکەر (دڵداری، خوازبێنی).

**woof** (wōōf), *n.* (١) پۆ؛ ڕێسمانی باری پانی قوماش.
(ووشەی " warp " ، " weft " ببینە).
(٢) قوماش؛ تەنراو؛ قوماشی چنراو.

**woof** (wōōf), *n.* (١) وەڕەی گوڕ؛ وەڕینی دەنگ گڕی سەگ.
(٢) دەنگێکی وەها.

**woofer** (woof′ẽr), *n.* دەنگ گەورەکەر (بەتایبەتی بۆ گەورەکردنی دەنگی نزمی لەرە کەم لەسەر ڕادیۆ... هتد).

**wool** (wool), *n.* (١) بەرگن؛ کوڵك. (٢) خوری؛ پەشم.
(٣) قوماشی خوری؛ جل‌وبەرگی خوری.
(٤) تووکی کورت و لوولی مرۆڤ (لەڕووی گاڵتەوە).
*adj.* خوری؛ لە خوری دروستکراو.

**pull the wool over one's eyes,** خەڵەتاندن؛ چاوبەستکردن؛ فریودان.

**wool clip,** بەرهەمی سالانەی خوری.

**woolen, woollen** (wool′ən), *adj.* (١) خوری؛ پەشمین؛ لە خوری دروستکراو. (٢) تایبەتی بە خوریو قوماشو جلی خوری.

*n.pl.* قوماشی خوری؛ جلوبەرگی خوری.

**wool fat,** = lanolin.

**wool-fell** (wool′fel′), *n.* = wool-skin.

**wool-gathering** (wool′gath′ẽr-iŋ), *n.* خەیال پلاوی؛ خەیال پەرستی؛ دالغەلێدان.

*adj.* خەیال پلاو. خەیال پەرست؛ دالغەچی.

**wool-grower** (wool′grō′ẽr), *n.* مەڕ بەخێوکەر بۆ خورییەکەی

**wollen** (wool′ən), *adj.* = woolen.

**woolly, wooly** (wool′i), *adj.* (١) پەشمینی؛ لە خوری دەچێ. (٢) خورياوی؛ بە خوری داپۆشراو. (٣) نەرم؛ نەرمونۆل (خواردەمەنی). (٤) لێل (بیر). نارروون. *( ~ thinking)*. (٥) بەرەڵا (لەرووی بێ یاساییەوە)؛ بێ یاسا. *( wild and ~ )*.

*n.* (١) (*pl.*) مەڕ. (٢) جلی خوری (بەتایبەتی جلی ژێرەوە).

-woolliness *(n.).*

**woolly bear,** جۆرە کرمێکی تووکنە وەک تەتلەمیران.

**wool-pack** (wool′pak′, *n.* (١) گونیەی خوری تێکراو. (٢) فەردە خوری؛ تا خوری. (٣) پەڵە هەوری تەنک.

**wool-sack** (wool′sak′), *n.* (١) توورەکە یا گونیەی خوری تێکراو. (٢) [W-] دۆشەکەڵەیەکە سەرۆکی ئەنجوومەنی لۆردەکانی پەرلەمانی ئینگلیزی لەسەری دادەنیشێ. (ب) سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی لۆردەکان؛ پلەی سەرۆکی ئەنجوومەنی لۆردەکان

**wool shed,** چەرداخی خوری؛ خانوویەکە مەڕی تێدا دەبڕێتەوەو خورییەکەی ئامادە دەکرێ بۆ فرۆشتن

**wool-skin** (wool′skin′), *n.* پێستە مەڕ بە خورییەکەیەوە؛ کەوڵی مەڕ (هەروەها " woolfell ").

**wool-sorters' disease,** نەخۆشییەکی سنگە تووشی ئەوانە دەبێ کە بەرگن پاك دەکەنەوە.

**wool-stapler** (wool′stap′lẽr), *n.* (١) خوری فرۆش؛ بازرگانی خوری. (٢) خوری جیاکەرەوەو پۆل پۆل کەر

**wooly** (wool′i), *adj.* & *n.* = woolly.

**woops** (wōops), *interj.* = whoops; oops.

**woozy** (wōō′zi, woo′zi), *adj.* (١) وڕ؛ گێژ. واق وڕماو؛ سەر لێ شێواو. (٢) گێژو دڵ تێکەڵهاتوو (بەهۆی عەرەق خواردنەوەوە)؛ سەرخۆش.

-woozily *(adv.)*; wooziness *(n.).*

**wop** (wop), *n.* [Slang]. ئیتالی (لەرووی سووکییەوە)؛ بنەچە ئیتالی.

**Worcestershire sauce,** سۆسی ووستەرشەر. سۆسێکی تووندو تیژە لە سرکەو بەهارات دروست دەکرێو دەکرێ بە گۆشتو شتی وەهاوە.

**word** (wũrd), *n.* (١) ووشە. واژە. (٢) ووتە؛ گوفتار؛ تێبینی. *( May I say a ~ about that?)*. (٣) (*pl.*) دووان؛ ئاخاوتن؛ قسە؛ گفتوگۆ. (٤) (*pl.*) دەقی گۆرانی؛ ووشەکانی گۆرانییەك. (٥) پەیمان؛ گفت؛ بەڵێن. *( He's a man of his ~ .)*. (٦) (ا) فەرمان. *( W~ came from the president.)*. (ب) پەرلە. نیشانە (ی نهێنی)؛ ووتەی نهێنی. (٧) (ا) دەنگوباس؛ هەواڵ؛ پەیام. *( the latest ~ ; no ~ from home)*. (ب) قاو. واتەوات. *( W~ has it she is married.)*. (٨) (*pl.*) (ا) دەمەقاڵێ؛ مشتومڕ؛ شەڕە قسە؛ ناکۆکی. (ب) قسەی ڕەق. *( ~s were exchanged between them.)*. (٩) [W-] قسەی خوا (ئینجیل، تەورات، قورئان). *( the W~ of God)*.

*v.t.* دەربڕین؛ چۆنێتی دەربڕین یا دارشتن؛ دارشتن. *( a carefully- ~ed contract, letter, etc.; He ~s his thoughts badly.; How should the statement be ~ed?)*

at a word, یەکسەر؛ دەستبەجێ.

be as good as one's word, پەیمان نەشکاندن؛ بەڵێن هێنانەدی.

big words, قسەی زل؛ فشە؛ لافوگەزاف.

break one's word, پەیمان شکاندن؛ بەڵێن نەهێنانەدی.

by word of mouth, بە دەمی؛ بە دەم؛ بە زار نەك بە نووسین.

eat one's words, پەشیمان بوونەوە؛ پاشگەزبوونەوە.

give one's word, بەڵێن دان؛ گفت دان؛ پەیمان دان.

hang on one's words, زۆر بە ووردی گوێ لێگرتن.

have a word with, قسە لەگەڵ کردن (بە کورتی).

have words with, مشتومڕ لەگەڵ کردن؛ شەڕە قسە کردن؛ دەمەقاڵێ بوون.

in a word, بە کورتی.

in other words, واتا؛ واتە.

in so many words, بەبێ زیادوکەم؛ دەقاودەق؛ بەو مانایە.

man of his word, پەیمان نەشکێن؛ پەیمان ڕاگر؛ بە گفت.

of few words, نەدوو؛ بێ دەنگ.

of many words, زۆروێژ؛ زۆربڵێ؛ هەڵەوەڕ.

take a person at his word, بڕواپێکردن؛ بڕوا بە ڕاستگۆیی کەسێك کردنو بەگوێرەی ئەوە جووڵانەوە:

*( I took her at her word.)*

take the words out of a person's mouth, قسە لە دەم دەرهێنان؛ ووتنی شتێك کە یەکێکی تر خەریك بووە یا بەتەما بووە بیڵێ.

the Word, قسەی خوا (ئینجیلو تەوراتو قورئان).

Upon my word, بە شەرەفم.

(upon) my word, پەهۆ!؛ پەکوو!.

word for word, ووشە بە ووشە؛ دەقاودەق:

*( a word for word translation)*

**wordage** (wũr′dij), *n.* (١) ووشە بەگشتی؛ ووشە. (٢) ژمارە یا سەرجەمی ووشە:

*( The ~ of the document exceeds one thousand.)*

(٣) درێژدادڕی؛ دووروودرێژی؛ درێژەپێدان؛ زۆروێژی. (٤) دارشتن؛ شێوەی دارشتن یا دەربڕین:

*( His ~ showed his lack of knowledge on the subject.)*

**word-blindness** (wũrd′blīnd′nis), *n.* کوێری خوێندنەوە: نەخۆشییەکی مێشکە دەبێتە هۆی شت بۆ نەخوێنرانەوە.

-word-blind *(adj.).*

**word-book** (wũrd′book′), *n.* فەرهەنگ؛ فەرهەنگۆك.

**word-deafness** (wũrd′def′nis), *n.* کەڕی قسە: نەخۆشییەکی مێشکە دەبێتە هۆی قسە تێنەگەیشتن.

**wordiness** (wũr′di-nis), *n.* درێژدادڕی؛ زۆروێژی؛ درێژەپێدان؛ دووروودرێژی.

**wording** (wũr′diŋ), *n.* دارشتن؛ دەربڕین؛ شێوەی دارشتنو دەربڕین؛ ووشە هەڵبژاردنو بەکارهێنان:

*( He liked the thought but not the ~ .)*

**wordless** (wũrd′lis), *adj.* لاڵ؛ نەدوو؛ بێ زمان؛ بێ دەنگ.

**word of honor,** بەڵێن؛ گفت؛ پەیمان؛ شەرەف خواردن.

**word order,** ڕستەسازی؛ چۆنێتی دانانی ووشە لە ڕستەدا بۆ مانا بەخشین؛ (چۆنێتی) ڕستە دارشتن. (ووشەی " syntax " ببینە).

**word play,** (١) repartee. (٢) قسە یا ووشەی دوو مانا؛ یاری کردن بە مانای جیاجیای ووشە (پێشی دەووترێ: " play on words "). (ووشەی " pun " ببینە).

**word square,** چوارگۆشەی ووشە: چوارگۆشەیەکە لە ووشەی وەها پێکهاتووە کە تیپەکانی بە ستوونی یا بە ئاسۆیی بخوێنرێتەوە.

**wordy** (wũr′di), *adj.* (١) ووشەیی؛ لە ووشە پێکهاتوو.

(٢) درێژدادڕ؛ دووروودرێژ؛ درێژەپێدراو؛ درێژ:
*( a ~ telegram, speech, article, etc.)*
**-wordily** *(adv.)*; **wordiness** *(n.)*.

**wore** (wôr, wōr), *past tense of* **wear**.

**work** (wûrk), *n.* (١) کار، ئیش، ئیش‌وکار؛ ڕەنج؛ ئارەق ڕشتن.
(٢) فرمان، ئیش‌وکار (بە پارە، واتا کە پێی دەژیت): *( He's out of ~ .)* .
(٣) پیشە *( His ~ is selling.)* .
(٤) (ا) ئەرك. (ب) ئەندازەی ئەم ئەرکە یا ئیشە: *( a day's ~ )* .
(٥) (ا) *(pl.)*، کردار: *( a person of good ~s)* .
(ب) *(pl.)*. گشت بەرهەمی وێژەیی نووسەرێك؛ نووسراوەکانی نووسەرێك:
*( the ~s of Piramerd)*
(ج) *(pl.)*. کار یا پرۆژەی ئەندازیاری (خانوو، پرد، بەنداو... هتد).
(د) سەنگەر. (ه) دەرزی‌و دروومان؛ نەقشکاری؛ نەخش‌ونیگار.
(و) بەرهەمی هونەری (تابلۆ، پەیکەر... هتد).
(٦) کەرەسەی شت لێ دروستکراو (٧) *(pl.)*، کارخانە؛ کارگە.
(٨) *(pl.)* پارچە ئیشکەرەکانی کاتژمێر.
(٩) شارەزایی ئیش؛ کارامەیی؛ وەستایی؛ باش‌و خراپی ئیش‌و ئەنجامەکەی:
*( good ~ )*
(١٠) کەف (خواردنەوەی ترشاو).
(١١) وورە گەیاندن (لە مەکینەیەکەوە بۆ یەکێکی تر یا لە پارچەی مەکینەیەکەوە بۆ پارچەیەکی تر) (فیزیا).
(١٢) کاری خێر (ئاین)؛ ئیشی باشە؛ چاکە.

*adj.* (١) هی ئیش: *( ~ clothes)* .
(٢) بۆ ئیش بەکارهێنراو؛ هی بار یا ئیش: *( ~ oxen)* .

*v.i.* (١) ئیشکردن؛ کارکردن؛ ڕەنجدان؛ ئارەق ڕشتن؛ کۆشش کردن.
(٢) فرمان کردن: ئیشکردن (بە پارە وەك مووچەخۆر یا کرێکار).
(٣) کارکردن (مەکینە)؛ گەڕان: *( The machine doesn't ~ .)* .
(٤) ترشان
(٥) سەرکەوتوو بوون؛ کاریگەر بوون؛ سەرگرتن: *( The plan ~ed.)* .
(٦) کارتێکردن *( The plea for help ~ed on their compassion.)* .
(٧) شێلان (هەویر، هێلم... هتد).
(٨) فڕین (چاو، ماسولکەی دەم‌وچاو... هتد)؛ گرژبوون؛ لەرزین:
*( His face ~ed with emotion.)*
(٩) وا لێ هاتن (بە هێنان‌و بردن‌و زۆر جوولاندن):
*( The door ~ed loose.)*
(١٠) کون تێکردن؛ ڕێگە بۆ خۆ کردنەوە:
*( Her elbow had ~ed through her sleeve.)*
(١١) شل بوونەوەو لێکترازانی گوریس‌و زنجیری کەشتی لە زەبری باوبۆران.

*v.t.* (١) بوون بەهۆی؛ هێنانەدی: *( His idea ~ed harm.)* .
(٢) داڕشتن؛ گەلاڵەکردن.
(٣) چنین؛ دەرزی‌و دروومان کردن؛ نەقشکاری کردن:
*( She ~ed the sweater.)*
(٤) لێکدانەوە (کێشەی بیرکاری)؛ شیکردنەوە.
(٥) نیگارکێشان؛ وێنەکێشان.
(٦) شێلان *( to ~ the dough well)* .
(٧) هێنانە سەر بارێکی تایبەتی بە جوولاندنەوە:
*( They ~ed the knot loose.)*
(٨) کێلان؛ خۆش کردن (زەوی): *( to ~ the soil)* .
(٩) خستنەگەڕ؛ خستنەکار؛ ئیشپێکردن.
(١٠) ترشاندن.
(١١) ئیشپێکردن (کرێکار): *( He ~s his men very hard.)* .
(١٢) کارتێکردن (بە قسەی مێچکە مێچکەو شتی وەها):
*( ~ him to your way of thinking.)*
(١٣) وورووژاندن؛ هێنانە جۆش *( She ~ed herself into a rage.)* .
(١٤) گەیشتنە ئامانجێك یا بارودۆخێك بە هەوڵدان؛ ڕێ بۆ خۆ دۆزینەوە:
*( They ~ed their way out of the wood.)*
(١٥) ئیش تێدا کردن:
*( The peddler who ~s our street is a good salesman.)*
(١٦) [Colloq.]، بەکارهێنان بۆ مەبەست‌و ئامانجی خۆ:
*( ~ your connections.)*
(١٧) [Colloq.]، هەڵخەڵەتاندن؛ فێڵ لێکردن؛ گزی لێکردن.

**at work,** خەریکی ئیشە؛ ئیش دەکات؛ خەریکە.
**get the works, [Slang],** بە ناشرینانە لەگەڵدا ڕەفتار کران؛ چەوسێنرانەوە.
**give someone the works, [Slang],** (١) کوشتن.
(٢) تووشی گێچەڵ کردن؛ چەوساندنەوە.
**make short ( or quick ) work of,** زوو تەواوکردن (ئیش، خواردن)؛ بە پەلە کردن یا خواردن؛ زوو بڕاندنەوە یا سەرکردن بە گۆمدا.
**out of work,** بێ ئیش؛ بێ ئیش‌وکار؛ بەتاڵ.
**the works, [Slang],** (١) هەموو شتێك:
*( We had the works, from appetizer to dessert.)*
(٢) چەوسانەوە؛ ئازاردان.
**work away (on),** ئیش تێدا کردن؛ بەردەوام بوون لە ئیش لەسەر کردندا؛ خەریکی کار بوون.
**work in ( or into ),** (١) تێخستن؛ جێگە کردنەوە:
*( He worked a few jokes into his lecture.)*
(٢) کات بۆ دۆزینەوە (بۆ بینین... هتد):
*( The doctor was very busy, but said he would try to work me in late in the afternoon.)*
**work in with,** گونجان؛ سازان
*( My plans did not work in with hers.)*
**work off,** (١) دانان (قەڵەوی... هتد)؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە (بە وەرزش):
*( We worked off the heavy meal by walking two miles.)*
(٢) ئیش کردن لەباتی؛ قەرز پاکردنەوە بە ئیش لەباتی پارە:
*( He worked off his debt, by working over-time.)*
**work on ( or upon ),** (١) کارتێکردن.
(٢) پێ سەلماندن؛ هەوڵی پێ سەلماندن دان.
**work out,** (١) هاتنە دەرەوە.
(٢) هیچ تێدا نەهێشتنەوە (کانگە).
(٣) قەرز پاکردنەوە بە ئیش لەباتی پارە.
(٤) هێنانەدی؛ کردن؛ جێبەجێکردن.
(٥) چارەسەرکردن؛ چارەکردن: *( to work out a problem)*
(٦) لێکدانەوە (بە ژماردن). (٧) سەرگرتن؛ ڕێکەوتن؛ سازان.
(٨) بوون بە هۆی. (٩) کردنە ئەوەندە.
(١٠) نەخشەکێشان؛ پیلان دانان؛ دانان:
*( They worked out a plan of action.)*
(١١) خستنەکار.
(١٢) وەرزش کردن: *( I'm working out every day.)* .
**work over,** (١) دووبارەکردنەوە؛ سەرلەنوێ کردنەوە.
(٢) [Slang]، لێدان؛ بیرازکردن؛ کوتان؛ زۆر تێهەڵدان‌و ئازاردان:
*( The gang had worked him over.)*
**work up,** (١) بەرەبەرە بەرزبوونەوە یا پێشکەوتن:
*( In just a few years he worked his way up and became chairman of the board.)*
(٢) لێ دروستکردن؛ گەڵاڵەکردن؛ داڕشتن.
(٣) وورووژاندن (هەست، برسێتی... هتد)؛ هێنانە جۆش.
(٤) نەخشەکێشان؛ پیلان دانان.
(٥) فێربوون.

**workable** (wûr'kə-b'l), *adj.* (١) ئیشی تێدا دەکرێ؛ چاك دەکرێ؛ خۆش دەکرێ (زەوی)؛ چۆن بویسترێ وەهای لێ دەکرێ:

*( ~ soil, material)*
(٢) کردەنی؛ کرداری؛ دەهێنرێتە دی؛ کاری پێ دەکرێ:
*( a ~ plan or scheme)*
-workability *(n.)*.

**workaday** (wûr′kə-dā′), *adj.* (١) هی ڕۆژانی ئیش.
(٢) ئاسایی؛ ڕۆژانە؛ ناتایبەتی: *( this ~ world, life, thing, etc.)* .

**workbag** (wûrk′bag′), *n.* توورەکەی ئیش (بەتایبەتی هی دەرزیو دەزووی نەخشکاری).

**workbench** (wûrk′bench′), *n.* مێزی کار (دارتاشی، مەکینەچیتی... هتد).

**work-book** (wûrk′book′), *n.* (١) دەفتەری مەشقی قوتابی. (٢) پەیڕەونامە. (٣) کارنامە. (٤) دەفتەری ئەو ئیشانەی کەسێک تەواوی کردووەو ئەوانەیش کە نیازی هەیە بیکات.

**work-box** (wûrk′boks′), *n.* سنووقی کار (بۆ هەڵگرتنی دەرزیو دەزووی نەخشکاری).

**work-day** (wûrk′dā′), *n. Also* working day, (١) ڕۆژی کار (نەک هی پشوو یا هەینی)؛ ڕۆژی ئیش کردن. (٢) سەرجەمی ساتی ئیشی ڕۆژانە: *( an eight-hour ~ )* .
*adj.* = workaday.

**worker** (wûr′kēr), *n.* (١) کرێکار؛ کارگەر؛ ڕەنجدەر؛ ڕەنجبەر؛ زەحمەتکێش. (٢) هەنگو مێرووڵەی ئیشکەر.

**work-farm** (wûrk′färm′), *n.* کێڵگەی ڕاگرتنی تاوانکارانی تاوانی بچووکو ئیش پێ کردنیان.

**workfolk** (wûrk′fōk′), *n. Also* workfolks, چینی کرێکار؛ چینی جووتیار؛ چینی زەحمەتکێشان.

**work force,** (١) گشت کارگەرانی کارگەیەک. (٢) هێزی ئیشکەری وڵات؛ کرێکارانی وڵاتێک بەگشتی؛ هەموو ئەوانەی ئیش دەکەنو دەتوانن ئیش بکەن.

**work-horse** (wûrk′hôrs′), *n.* (١) بارگیر. (٢) [Colloq.] کەری بار: (ا) کەسێکی زۆر ئیشکەر؛ کەسێکە کە زۆربەی ئەو ئیشە دەکات کە دراوە بەسەر تاقمەکەیدا. (ب) ئوتومبیلێک یا مەکینەیەکی زۆرباشو بەرگەگر.

**work-house** (wûrk′hous′), *n.* (١) کارگەی بچووک؛ وەرشە. (٢) تەمەڵخانە؛ هەژارخانە (لە ئینگلتەرە کە ئەوەی بتوانێ ئیشی پێ دەکرێ). (٣) بەندیخانەی تاوانکارانی بچووکو ئیش پێ کردنیان.

**working** (wûr′kiŋ), *adj.* (١) ئیشکەر. (٢) هی ئیش کردن: *( a ~ day; ~ clothes)* . (٣) کار جێبەجێکەر؛ ئەوەندە هەیە کە کاری پێ ببرێ بەڕێوە:
*( They have a ~ majority in the parliament.; She has a ~ knowledge of English.)*
(٤) هی بناغەیی؛ گەڵاڵەکراو: *( a ~ hypothesis)* . (٥) دەفرێ (چاو، ماسولکەی لەش).
*n.* (١) ئیش، کار. (٢) شێوەی ئیش کردن. (٣) چارەکردن. (٤) ( *pl* ). هەڵکەندن یا لێدان (کان). (٥) ترشان. (٦) خۆ بەکێش کردن؛ بە زەحمەت ڕۆیشتن. (٧) فرین (چاو، ماسولکەی دەموچاو و لەش).

**working capital,** (١) سەرمایەی کار: ئەو سەرمایەیەی پێویستە بۆ بەڕێوەبردنی دەزگایەکی بازرگانی یا پیشەسازی... هتد. (٢) سامانی دەزگایەک پاش لێ دەرکردنی قەرزەکانی؛ مایە؛ مایەی ڕاستەقینەی دەزگایەک. (٣) سەرمایەی بە دەستەوە: ئەو سەرمایەیەی دەزگایەکە کە دەتوانرێ یەکسەر بفرۆشرێو بکرێ بە پارە؛ پارەی ڕەق.

**working-class** (wûr′kiŋ-klas′, wûr′kiŋ-kläs′), *adj.* چینی کرێکار؛ تایبەتی بە چینی ڕەنجدەران.

**working class,** چینی کرێکار؛ چینی ڕەنجدەران.

**working-day** (wûr′kiŋ-dā′), *adj.* هی ئیش، هی ڕۆژانی ئیش

**working day,** = work-day.

**working drawing,** نەخشەی کار.

**working-man** (wûr′kiŋ-man′), *n.* کرێکار؛ ڕەنجدەر؛ کارگەر؛ ئیشکەر.

**working papers,** بەڵگەنامەی ئیش.

**working-woman** (wûr′kiŋ-woom′ən), *n.* ژنی ئیشکەر.

**workless** (wûrk′lis), *adj.* بێ ئیش؛ بێ ئیشوکار؛ بەتاڵ.

**workload** (wûrk′lōd′), *n.* کار یا ئەرکی جێبەجێکراو لەلایەن کرێکارێک یا دەستەیەک کرێکارەوە لە ماوەیەکی تایبەتیدا؛ ئەرکی بەسەردا دراو بۆ تەواوکردن لە ماوەیەکی تایبەتیدا.

**workman** (wûrk′mən), *n.* (١) working-man . (٢) پیشەگەر؛ پیشەساز: *( a creative ~ )* .

**workmanlike** (wûrk′mən-līk′), *adj. Also* workmanly, (١) لە پیشەگەر هاتوو؛ بۆ پیشەگەر شیاو. (٢) کارامە؛ وەستایانە؛ ڕێکوپێک: *( ~ pottery)* .
*adv.* بە کارامەیی.

**workmanship** (wûrk′mən-ship′), *n.* (١) کارامەیی؛ وەستایی؛ شارەزایی ئیش. (٢) باشو خراپی ئیشو ئەنجامی:
*[ articles of excellent ( or poor) ~ ]*
(٣) ئیش؛ بەرهەمی کار: *( The bookcases are my ~ .)* .

**workmen's compensation,** بیمەی کار: بیمەیەکە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەسەر کار ئازاریان پێ دەگات، بریندار دەبن، یا نەخۆش دەکەون.

**work of art,** (١) بەرهەمی هونەری (بەتایبەتی تابلۆو پەیکەر). (٢) کارێک یا بەرهەمێکی جوانو نایابی هونەری (پەیکەرتاشی، خانووسازی، نیگارکێشی، شانۆگەری، گۆرانی... هتد)؛ شتێکی زۆر جوان کراو.

**work-out** (wûrk′out′), *n.* (١) مەشقی وەرزش؛ یاری (بۆ تەندروستی). (٢) ئەرکێکی گران.

**work-people** (wûrk′pē′p'l), *n.pl.* کرێکاران؛ کارگەران؛ ڕەنجدەران.

**work-room** (wûrk′rōōm′, wûrk′room′), *n.* ژووری کار.

**work-shop** (wûrk′shop′), *n.* (١) کارخانە؛ کارگە. (٢) کۆڕێکە دەبەسترێ بۆ لێکۆڵینەوەی باسێکی تایبەتی:
*( a ~ in short-story writing; a poetry ~ )*

**worktable** (wûrk′tā′b'l), *n.* مێزی کار.

**workweek** (wûrk′wēk′), *n.* هەفتەی ئیش؛ سەرجەمی سات یا ڕۆژی ئیش لە هەفتەیەکدا: *( a 40-hour ~ ; a five-day ~ )* .

**work-woman** (wûrk′woom′ən), *n.* کرێکاری ژن؛ ڕەنجدەری ژن.

**world** (wûrld), *n.* (١) سەرزەمین؛ زەمین. (٢) جیهان؛ گێتی؛ دنیا. (٣) خەڵکی هەموو جیهان. (٤) گەردوون.
(٥) (ا) بەشێکی جیهان یا سەرزەمین: *( the Western W~ )* .
(ب) چەرخی مێژوو: *( the ancient ~ )* .
(ج) جیهان: *( the animal ~ )* .
(د) جیهان؛ مەودای چالاکییەکی تایبەتی: *( the music ~ )* .
(٦) هەڵوێستو بیروڕاو شارەزایی کەسێک: *( His ~ is narrow.)*
(٧) (ا) ژیانی ئەم جیهانە؛ ژیانی کۆمەڵایەتی نەک ئاینی؛ ئەمەودنیا.
(ب) ئەوانەی بە تەنگ ژیانی ئەم دنیایەوە دێن نەک ئەوەودنیا، واتە دوای مردن.
(٨) زۆر؛ ئێجگار زۆر: *( The rest did him a ~ of good.; There is a ~ of difference between them.)*
(٩) ئەستێرە؛ ئەستێرەی گەڕۆک.

bring into the world, منداڵبوون؛ بوون؛ هێنانە دنیاوە.

come into the world, لەدایکبوون؛ هاتنە دنیاوە.

for all the world, (١) بۆ هیچ شتێک لە دنیادا؛ بۆ هەموو دنیا:
*( I wouldn't do it for all the world.)*
(٢) دەقاودەق؛ بێ کەموزیاد؛ بە تەواوی.

in the world, (١) لە سەرزەمیندا؛ لە جیهاندا؛ هەر شوێنێک.

(۲) هیچ؛ هەرگیز
*( I never in the world would have believed such a lie.)*
(۳) ئەری ئەوە؛ ئەرێ پێم ناڵێی؟؛ ئەرێ:
*( Where in the world did you find that funny shirt?)*
**World Court,** دادگای جیهانی ناکۆکی نێو دەوڵەتان دەبڕێنێتەوە.
**worldliness** (wûrld′li-nis), ***n.*** (۱) جیهانێتی؛ تایبەتێتی بەم جیهانە (۲) خۆشی جیهان پەرستی؛ خۆشی دنیاخوازی؛ جیهان پەرستی.
(۳) دنیادیبیدەیی؛ شارەزایەتی کاروباری ژیان‌و جیهان.
**worldling** (wûrld′liŋ), ***n.*** کەسێکی خۆشی جیهانی پەرست؛ خۆشی جیهانی خوازێك؛ جیهان پەرستێك.
**worldly** (wûrld′li), ***adj.*** (۱) جیهانی؛ تایبەتی بەم جیهانە نەك بە جیهانی ئاینی‌و ئاسمانی‌و ئەوەودنیایی. (۲) خۆشی جیهانی پەرست؛ خۆشی جیهانی خواز؛ جیهان پەرست؛ خۆشی پەرست.
(۳) دنیادیبیدە؛ شارەزای ژیان‌و کاروباری جیهان؛ تێگەیشتوو.
**worldly-minded** (wûrld′li-mīn′did), ***adj.*** خەریکی کاروباری جیهان؛ جیهان پەرست؛ بیرکەرەوە لەم جیهانە نەك ئاینی‌و دوای مردن.
**worldly-wise** (wûrld′li-wīz′), ***adj.*** دنیادیبیدە؛ تێگەیشتوو؛ شارەزای ژیان‌و کاروباری جیهان.
**world power,** هێزی جیهانی؛ وڵاتێکی ئەوەندە بەهێز کە کاریکاتە سەر کاروباری جیهانی‌و نێو دەوڵەتان.
**world series,** ڕستە یاری ساڵانەی بێسبۆڵ
**world-shaking** (wûrld′shā′kiŋ), ***adj.*** زۆر گرنگ؛ دنیا هێنەرە لەرزین: *( a ~ event)* .
**World War,** جەنگی گشتی؛ شەڕی جیهانی.
**world-weary** (wûrld′wêr′i), ***adj.*** لە ژیان بێزار؛ تاقەت لە ژیان چوو
**-world-weariness** ***(n.).***
**world-wide** (wûrld′wīd′), ***adj.*** جیهانی؛ سەرانسەری جیهان؛ گشت جیهان.
**worm** (wûrm), ***n.*** (۱) کرم
(۲) کەسێکی پیسی بۆگەن؛ کەسێکی هیچ‌وپووچ.
(۳) شتێکی وەك کرم (وەك ددانی برغوو).
(٤) هێزێکی زیانبەخشە کە لە ژێرەوەو بە نهێنی شت دادەوەشێنێ‌و بن کەن دەکات‌و دەخواتەوە: *( the ~ of conscience)* .
(٥) (ا) Archimedean screw .
(ب) برغوویەکی خوولاوەیە کە ددانەکانی لە ددانەکانی چەرخێك گیر دەبێ.
(٦) نەخۆشی کرمی ڕیخۆڵەو سك. (۷) lytta .
***v.i.*** بە پێچاوپێچ ڕۆیشتن.
***v.t.*** (۱) بە پێچاوپێچو بە فێڵ چوونە ژوورەوە؛ بە زۆڵێتی جێبەجێکردن.
(۲) بە فێڵ قسە لێ دەرهێنان؛ بە قسەی خۆش‌و مێچکە مێچکە ئامانجی خۆ هێنانەدی (۳) ڕیخۆڵە یا سك پاکردنەوە لە کرم.
(٤) بەن ئالاندن لە گوریس‌و پەتەوە بۆ سفت کردنی (کەشتیوانی).
**worm-eaten** (wûrm′ēt′n), ***adj.*** (۱) کرم خواردوو؛ کرماوی؛ کرمن؛ کرمۆڵ؛ کرم تێداو؛ سنگاناوی. (۲) دارزاو؛ داوەشاو؛ گەنیو.
(۳) پەرپووت؛ کۆن؛ باونەماو.
**worm fence,** تەیمانی پێچاوپێچ. (هەروەها " snake fence ") .
**worm gear,** (۱) worm wheel .
(۲) چەرخی دانداری برغووی ددان لێك گیربوو.
**worm-hole** (wûrm′hōl′), ***n.*** کونە کرم
**worm-root** (wûrm′rōōt′, wûrm′root′), ***n.*** گیایەکە ڕەگەکەی دەرمانی کرمی لێ درووست دەکرێ.
**worm wheel,** چەرخێکی دانداری ددانەکانی لە برغووی خولاوەوە گیر دەبێ
**wormwood** (wûrm′wood′), ***n.*** (۱) ئەفسەنتین ڕووەکێکە دەرمان‌و خواردنەوەیەکی تاڵی مەستکەری لێ درووست دەکرێ.
(هەروەها " absinthe ") .
(۲) بەسەرهاتێکی زۆر ناخۆش‌و تاڵ‌و ڕیسواکەر؛ تاڵی؛ ناخۆشی.
**wormy** (wûr′mi), ***adj.*** (۱) کرم خواردوو؛ کرماوی؛ کرمۆڵ؛ کرمن؛ سنگاناوی: *( a ~ apple)* .
(۲) لە کرم دەچێ؛ وەك کرم وایە.
(۳) پیس؛ نزم (مرۆڤ، کردەوە).
**worn** (wôrn, wōrn), *past participle of* **wear.**
***adj.*** (۱) (ا) کۆنە. (ب) دڕاو؛ شڕ؛ سوواو:
*( ~ tires, clothes, etc.; a ~ pocket)*
(۲) ماندوو؛ هیلاك؛ پەککەوتوو؛ بێ تین؛ کفت.
(۳) پەرپووت؛ کۆن‌و باو نەماو (بیروڕا، نوکتە، ووتە... هتد).
**worn-out** (wôrn′out′, wōrn′out′), ***adj.*** (۱) دڕاو؛ شڕووڕ؛ شڕ؛ زۆر کۆن: *( a ~ suit)*
(۲) زۆر ماندوو؛ زۆر هیلاك؛ پەککەوتوو؛ کفت.
**worriment** (wûr′i-mənt), ***n.*** [Colloq.], = **worry.**
**worrisome** (wûr′i-səm), ***n.*** (۱) ناخۆش (بارودۆخ، کێشە)؛ مایەی مەراق‌و دڵەڕاوکێیە؛ بێزارکەر: *( a ~ problem, situation, etc.)*
(۲) مامە خەمە؛ خەفەت خۆر؛ مەراق خۆر.
**worry** (wûr′i), ***v.t.*** (۱) (ا) ددان تێ گیراندن‌و ڕاکێشان پەیتاپەیتا؛ گازلێگرتن‌و ڕاتەکاندن: *( a dog ~ing a bone)* .
(ب) یاری پێکردن (بە زمان)؛ هێنان‌و بردن پەیتاپەیتا:
*( He was ~ing a sore tooth with his tongue.)*
(۲) پەستکردن؛ بێزارکردن؛ سەرکونکردن:
*( Don't ~ me with your complaints.)*
(۳) تووشی مەراق کردن؛ تووشی خەم‌وخەفەت‌و دڵەڕاوکێ کردن.
***v.i.*** (۱) ددان تێ گیران‌و ڕاکێشان پەیتا پەیتا.
(۲) مەراق خواردن؛ خەفەت خواردن؛ خەم خواردن.
(۳) ( ~ along; ~ through )، دەربردن بە هەرچۆنێك بێ؛ هەوڵدان؛ هەڵکردن بە گران: *( to ~ through a problem)* .
***n.*** (۱) مەراق؛ خەفەت؛ دڵەڕاوکێ؛ دەردی سەری؛ دڵەڕاوکێ؛ خەم؛ خەم خواردن.
(۲) هۆی خەم‌وخەفەت؛ هۆی مەراق‌و دڵەڕاوکێ.
**-worrier** ***(n.).***
**worry-wart** (wûr′i-wart′), ***n.*** [Colloq.], مامە خەمە؛ کەسێکی زۆر مەراق خۆر.
**worse** (wûrs), ***adj.*** | *comperative of* **bad, ill** |, (۱) خراپتر؛ بەدتر؛ گەندتر؛ گەنگتر؛ ناپەسەندتر:
*( John is bad but his brother is ~ .)*
(۲) نەخۆشتر؛ خراپتر (تەندروستی).
***adv.*** (۱) بەشێوەیەکی خراپتر؛ خراپتر:
*( You're playing much ~ than you did yesterday.)*
(۲) زیاتر: *( It's raining ~ than ever.)* .
(۳) نەخۆشتر؛ خراپتر (تەندروستی).
***n.*** شتێکی خراپتر یا ناپەسەندتر؛ بارودۆخێکی خراپتر.
**none the worse,** کەمتر نا؛ باشتر؛ زیاتر:
*( I will like you none the worse if you speak frankly.)*
**worse off,** خراپتر (گوزەران)؛ هەژارتر:
*( He has lost his job and is worse off than ever.)*
**worsen** (wûr′s'n), ***v.t.*** خراپترکردن.
***v.i.*** خراپتربوون؛ بەرەو خراپی ڕۆیشتن.
**worser** (wûrs′ēr), ***adj. & adv.*** = **worse.**
**worship** (wûr′ship), ***n.*** (۱) پەرستن؛ خواپەرستی:
*( A mosque is a place of ~ .)*
(۲) ڕێزو خۆشەویستی‌یەکی ئێجگار زۆر؛ پەرستن:
*( hero ~ ; the ~ of success)*
(۳) شتێکی پەرستراو یا زۆر ڕێز لێ گیراو.

(٤) [Chiefly British]، خاوەن شكۆ: بۆ دادوەرو كاربەدەستی بەرزی تر بانگ كردن. (٥) [Obs.]، گەورەیی؛ بەرزی؛ شكۆ.

*v.t.* (١) پەرستن: خوایەرستن. (٢) زۆر ڕێزگرتن و خۆش ویستن؛ پەرستن.

*v.i.* خوایەرستن: پەرستن

**worshiper, worshipper** (wûr′ship ēr), *n.* خوایەرست: پەرستیار

**worshipful** (wûr′ship-fəl), *adj.* (١) هەست بە خوایەرستن كرد: ڕێزگر. (٢) [Chiefly British]، خاوەن شكۆ: بۆ دادوەرو كاربەدەستی بەرزی تر بانگ كردن

-**worshipfully** *(adv.)*; **worshipfulness** *(n.)*.

**worst** (wûrst), *adj.* | *superlative of* **bad, ill** |, خراپترین: بەدترین؛ گەندترین؛ گەنكترین؛ ناخۆشترین؛ ناپەسەندترین.

*adv.* بە خراپترین و ناپەسەندترین شێوە.

*n.* خراپترین و ناپەسەندترین شت.

*v.t.* بەزاندن؛ بەسەردا زاڵبوون: *( He ~ed his enemies.)* .

**at (the) worst,** لە خراپترین حاڵەتدا؛ ئەگەر هەر زۆر خراپ بوو؛ پەڕی ئەوبەری (لە باری خراپی‌یەوە)

**get the worst of it,** بەزین: دۆڕاندن؛ شكان؛ ژێركەوتن

**give one the worst of it,** بەزاندن؛ بەسەردا زاڵبوون.

**if worst comes to worst,** ئەگەر خراپترین شت ڕوویدات؛ لە خراپترین حاڵەتدا؛ ئەگەر شت هەر ئێجگار خراپ بوو.

**(in) the worst way,** [Slang], ئێجگار زۆر؛ زۆر

**worsted** (woos′tid, woor′stid), *n.* (١) ڕێسی خوری تورت و باش. (٢) قوماشی سفت و تورتی لەم ڕێسە دروستكراو.

*adj.* لە ڕێسی خوری تورت و باش دروستكراو: *( ~ cloth)* .

**wort** (wûrt), *n.* ئاوجۆی ترشاو (كە بیرەی لێ دروست دەكرێ).

**wort** (wûrt), *n.* گیا؛ ڕووەك: گیای بۆن خۆش: *( spleenwort, liverwort)*

**worth** (wûrth), *n.* (١) بەها؛ نرخ: بایی.

(٢) بایەخ: گرنگی؛ كەڵك؛ بە بایەخی.

(٣) بایی ئەوەندە؛ بایی: *( a dollar's ~ of sugar)* .

(٤) سامان

*adj.* (١) شایان؛ شایستە؛ شایانی ئەوەیە؛ دەهێنێ؛ هەڵ دەگرێ.

(٢) بایی ئەوەندەیە: ئەوەندە دەهێنێ یا هەڵ دەگرێ.

(٣) ئەوەندەی پارە یا سامان هەیە.

**for all one is worth,** بە هەموو توانایەكەوە؛ بەوپەڕی تواناوە.

**put in one's two cents worth,** ڕای خۆ دەربڕین.

**worth** (wûrth), *v.i.* [Archaic], بەسەرهاتن؛ لێ ڕوودان؛ لێ هاتن.

**worthiness** (wûr′*th*i-nis), *n.* بەنرخی؛ بەبایەخی: نرخ؛ بایەخ؛ هێنان؛ هەڵگرتن؛ شایان بوون.

**worthless** (wûrth′lis), *adj.* (١) بێ سوود؛ بێ نرخ؛ هیچ‌وپووچ؛ بێ كەڵك؛ بێ فەڕ؛ هیچ ناهێنێت. (٢) خوێڕی؛ ناڵەبار؛ هیچ؛ بێ نرخ؛ بێ ڕێز.

-**worthlessness** *(n.)*.

**worthwhile** (wûrth′hwīl′), *adj.* بەكەڵك؛ بەسوود؛ بەنرخ؛ بە بایەخ؛ دەهێنێ: *( a ~ book, project, idea, effort, etc.)* .

**worthy** (wûr′*th*i), *adj.* (١) بەنرخ؛ بەكەڵك؛ بەسوود؛ بەبایەخ.

(٢) بەڕێز؛ شایستەی ڕێزە؛ باش؛ لێهاتوو: *( a ~ fellow)* .

(٣) شایانی ئەوەیە: *( an organization ~ of support)* .

*n.* كەسێكی بەڕێزو بەناوبانگ؛ كەسێكی لێهاتوو.

-**worthily** *(adv.)*.

**wot** (wot), [Arch.], *first and third person singular, present indicative of* **wit.**

**would** (wood), *past tense of* **will,** (١) ئەگەر؛ بە مەرجێك: *( I ~ write if you ~ reply.)*

(٢) ویستن؛ ئارەزووكردن؛ حەزكردن: *( What ~ you?)* .

(٣) خۆزگە؛ بریا: *( W~ that she were still here.)* .

(٤) نیازی كردنی شتێك لە داهاتوودا: *( He said he ~ bring it.)* .

(٥) تكایە؛ دەتوانی؟: *( W~ you help me, please?)* .

**would** (wōld), *n.* جۆرە ڕووەكێكە. (هەروەها " **weld** ") .

**would-be** (wood′bē′), *adj.* وا حەزكەر یا خۆ پیشاندەر؛ خواستیار: *( a ~ actor, artist, leader, poet, etc.)* .

**wouldn't** (wood′'nt), = **would not.**

**wouldst, wouldest** (woodst), [Archaic], *second person singular of* **will.**

**wound** (wōōnd), *n.* برین؛ زام.

*v.t.* بریندارکردن؛ زامدارکردن.

*v.i.* برینداربوون؛ زامداربوون.

**wound** (wound), *past tense and past participle of* **wind.**

**wounded** (wōōn′did), *adj.* بریندار؛ زامدار: *( a ~ soldier; ~ pride)*

*n.* **( the ~ ),** برینداران؛ بریندارەكان؛ زامداران.

**wove** (wōv), *past tense and past participle of* **weave.**

**woven** (wōv′'n), *past participle of* **weave.**

**wow** (wou), *interj.* پەححا!؛ پەككو!؛ بەمبەم: ووتەیەكە خۆشی، سەرسامی، ئازار... هتد دەردەبڕێ: *( W~ ! look at that!)* .

*n.* [Slang], (١) شتێكی زۆر سەیر.

(٢) شتێكی زۆر سەركەوتوو؛ سەركەوتنێكی تەواو.

*v.t.* [Slang], سەرسوڕماندن و دڵفڕاندن بە كرداری سەیر سەیر: *( The gymnast ~ed the spectators.)*

**wow** (wou), *n.* جیاوازی‌یەكی كەم لە بەرزی و نزمی گۆرانی و مۆسیقای تۆماركراودا.

**wowser** (wou′zēr), *n.* دەمارگیرێكی ئاینی ئوستورالی.

**wrack** (rak), *n.* (١) وێرانكردن؛ وێرانی؛ فەوتان؛ لەناوچوون؛ تێكدان؛ كاول بوون: *( to bring to ~ and ruin)* .

(٢) كەشتی تێكشكاو؛ لاشەی كەشتی تێكشكاو.

(٣) گیای دەریایی ڕامالراوە سەر كەناری دەریا.

(٤) [Scot. & Dial.]، گیا؛ گژوگیا.

*v.t.* وێرانكردن؛ كاول كردن.

*v.i.* وێران بوون؛ كاول بوون.

**wrack** (rak), *n.* پەڵەهەوری بابردوو. (هەروەها " **rack** ") .

**wraith** (rāth), *n.* تارمایی كەسێكە كە پێش یا پاش مردنی بینرابێ؛ تارمایی؛ خێو.

**wrangle** (raŋ′g'l), *v.i.* شەڕە دەنووك كردن؛ شاتەشات كردن؛ مشت‌ومڕكردن بە دەنگی بەرز.

*v.t.* (١) شەڕە دەنووك كردن؛ شاتەشات كردن؛ مشت‌ومڕكردن بە دەنگی بەرز.

(٢) ڕاپێچانی ڕەشەووڵاخ و ووڵاخی بەرزە.

*n.* شەڕە دەنووك؛ شاتەشات؛ دەم قڕە؛ دەمەقاڵێ؛ مشت‌ومڕ.

**wrangler** (raŋ′glēr), *n.* (١) (حەز لە) شەڕە دەنووك كەر؛ مشت‌ومڕانی؛ شاتەشاتكەر.

(٢) ڕاپێچكەری ڕەشەووڵاخ و ووڵاخی بەرزە؛ كاوبۆیەك كە ئەمە ئیشەكەیەتی.

(٣) قوتابی پلەی هەرە بەرزی ڕشتەی بیركاری زانكۆی كامبرج.

**wrap** (rap), *v.t.* (١) تێوەپێچان: *( She ~ped her coat about her.)*

(٢) داپۆشین.

(٣) پێچانەوە: *( She ~ped the gift in colorful paper.)* .

(٤) شاردنەوە؛ داپۆشین؛ كردن بە ژێرەوە: *( The housetops were ~ped in smoke.)*

(٥) تێوەئاڵاندن: *( She ~ped her arms around him.)* .

(٦) تێدا نوقوم بوون (مەجاز)؛ كەوتنە ناو: *( ~ped in greif; ~ped in thought)*

*v.i.* تێوەئاڵان؛ با خواردن بە دەوردا:
*( The flag ~ped around the pole.)*
*n.* (١) عابا؛ دەستماڵ؛ چارۆکە؛ سەرپۆش؛ بەرگی ئاودامانی سەرەوە؛ کۆڵوانە؛ ڕۆب (٢) بەتانی؛ پەتۆ (٣) کاغەزی شت پێچانەوە.
(٤) (*pl*) نهێنی؛ پەنهانی: *( The plans were kept under ~s.)* .
**keep under wraps,** بە نهێنی هێشتنەوە؛ ئاشکرا نەکردن؛ شاردنەوە؛ نەدرکاندن *( They kept the plans under wraps.)* .
**wrap up,** کۆتایی پێ هێنان؛ دوایی پێ هێنان؛ بڕینەوە:
*( to wrap up a discussion, speech, meeting, etc.)*
**wrap up in,** (١) زۆر پێوە خەریك بوون (ئیش، بیرکردنەوە... هتد).
(٢) دەست تێدا بوون (پیلان)؛ پێوە بوون (تاوانکاری)؛ تێوەگلان.
**wrap-around** (rap′ə-round′), *n.* عابا؛ دەستماڵ؛ سەرپۆش؛ چارۆکە؛ بەرگی ئاودامانی سەرەوە؛ کۆڵوانە.
**wrapper** (rap′ēr), *n.* (١) پێچەرەوە.
(٢) کاغەزی شت پێچانەوە؛ تێپێچ؛ کاغەزی شت تێوەپێچان: *( a candy ~ )* .
(٣) کاغەزی پێچراوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەی بە پۆستە نێردراو.
(٤) [Chiefly British]، بەرگی کاغەزی بەرگە کتێب (کە بریتییە لە کاغەزێکی ئەستوورو قایم و بریقەدار). (٥) کاغەزی جگەرەو سیگار.
(٦) ڕۆبی ژنانە؛ بەرگی لە خۆوە پێچراو.
**wrapping** (rap′iŋ), *n.pl.* کاغەزی شت پێچانەوە.
**wrapping paper,** کاغەزی شت پێچانەوە.
**wrapt** (rapt), *past tense and past participle of* wrap.
**wrap-up** (rap′up′), *n.* کورتەی دەنگوباس؛ کورتە.
**wrasse** (ras), *n.* ماسییەکی دەریایی پەڕەکە دڕکاوی ڕەنگ گەشە.
**wrath** (rath, räth; Brit. rôth), *n.* (١) ڕقێکی ئێجگار زۆر؛ قینی زۆر؛ زۆر تووڕەیی. (٢) (ا) تۆڵە؛ سزای بە قین.
(ب) سزای خوا بۆ تاوانکاران؛ تۆڵە سەندنەوەی خوا: *( the ~ of God)* .
*adv.* [Archaic], = **wrathful.**
**wrathful** (rath′fəl, räth′fəl), *adj.* (١) زۆر تووڕە.
(٢) هی تووڕەییە؛ بە قینەوە کراو؛ هی ڕق و تۆڵەیە: *( ~ vengeance)* .
**-wrathfully** *(adv.)*; **wrathfulness** *(n.)*.
**wreak** (rēk), *v.t.* (١) سزادان؛ زیان لێدان
*( They ~ed havoc on the enemy.)*
(٢) داخی دڵی خۆ پێ ڕشتن:
*( The teacher ~ed his anger on the students.)*
(٣) [Archaic]، تۆڵەسەندن؛ تۆڵەکردنەوە.
**wreath** (rēth), *n.* (١) گوڵبەند؛ ئەڵقە گوڵ؛ تاجە گوڵ؛ چەپکە گوڵ.
(٢) ئەڵقە؛ شتێکی شێوە ئەڵقەیی: *( ~s of smoke)* .
(٣) ناوی کۆنەستێرەیەکە.
**wreathe** (rē*th*), *v.t.* (١) لە یەکترییەوە ئاڵاندن و لوول کردن (بەتایبەتی بۆ ئەڵقە گوڵ دروستکردن). (٢) تێوەئاڵان؛ تێهەڵکێشان.
(٣) بە گوڵبەند ڕازاندنەوە. (٤) هەموو گرتنەوە یا داپۆشین
*v.i.* (١) لوول خواردن؛ بە پێچاوپێچ بزوان.
(٢) ئەڵقە بەستن؛ ئەڵقە ئەڵقە وەستان
**wreck** (rek), *n.* (١) (ا) وێران بوون؛ تێکشکان؛ شکان؛ تێكوپێکدان.
(ب) تێکشکانی کەشتی. (٢) لاشەی کەشتی تێکشکاو.
(٣) پارچەی لاشەی کەشتی شکاو و بارگەکەی کە ئاو ڕای ماڵیبێتە کەناری دەریا. (٤) لاشەی شتی تێکشکاو یا تێکدراو (ئوتومبیل، فڕۆکە... هتد).
(٥) کەسێکی نەخۆش یا ماندوو پەککەوتوو؛ شتێکی شکاو و لە کەڵك کەوتوو:
*( He was a ~ .; The hat was a ~ .)*
*v.t.* (١) تێكوپێکدان (بە ڕێکەوت یا بە دەسەنقەست)؛ شکاندن:
*( He ~ed his car in the accident.)*
(٢) ڕووخاندن (خانوو)؛ هەڵوەشاندنەوە
(٣) وێرانکردن؛ کاول کردن؛ تێكوپێکدان
(٤) تێکدان؛ پووچ کردنەوە. *( to ~ an opportunity, a plan, etc.)* .
(٥) تێکدان: *( He ~ed his health.)* .
*v.i.* (١) (ا) تێکشکان؛ تێكوپێکدران؛ ڕووخان. (ب) وێرانکردن؛ کاول بوون.
(٢) هێنانەدەرەوەی کەشتی نوقوم بوو و تێکشکاو (بۆ تاڵانکردنی یا چاکردنەوەی).
**wreckage** (rek′ij), *n.* (١) تێکشکان؛ تێكوپێکدان؛ وێرانکردن؛ ڕووخان. (٢) لاشەی فڕۆکەو کەشتی و شەمەندەفەرو ئوتومبیلی تێکشکاو؛ شتی شکاو یا تێكوپێکدراو.
**wrecker** (rek′ēr), *n.* (١) (ا) شکێنەر؛ وێرانکەر؛ تێكوپێکدەر؛ ڕووخێنەر. (ب) تێکدەر؛ پووچکەرەوە:
*( a ~ of dreams, opportunities, etc.)*
(ج) خانوو ڕووخێنەر (بۆ تازەکردنەوەی)؛ کارگەری تیپی خانوو ڕووخاندن.
(٢) (ا) لۆری ڕاکێشەری ئوتومبیلی شکاو و پەککەوتوو و کۆنە.
(ب) شەمەندەفەرو کەشتی ڕاکێشەری شەمەندەفەرو کەشتی شکاو یا نوقوم بوو.
(٣) (ا) فریوبازێکە کە دەبێتە هۆی تێکشکانی کەشتییەك بە نیازی تاڵانی.
(ب) تاڵانکەری کەشتی تێکشکاو.
**wrecking** (rek′iŋ), *n.* تێکشکان؛ شکاندن؛ ڕووخان؛ تێكوپێکدان.
*adj.* (١) تێکدان؛ وێرانکاری.
(٢) ڕووخێنەر (خانوو)؛ هی ڕاکێشانی ئوتومبیلی شکاو یا پەککەوتوو
*( a ~ crew)*
**wren** (ren), *n.* فیسقەگولە؛ فیرنەگولە
**wrench** (rench), *n.* (١) بە توندی ڕاکێشان؛ ڕاتەکان؛ گوشین؛ بە توندی بادان (٢) لە جێ چوون (جومگە، پشت)؛ گۆت بوون؛ جەمام؛ ئازار گەیشتن (ماسولکە). (٣) سوێ؛ پەژارە؛ دڵتەنگییەکی زۆر؛ خەفەتی زۆر؛ دڵ گوشران؛ دڵ دەرهاتن:
*( the ~ of saying good-by to a loved one)*
(٤) شێوان (دەقی ووتار، لێکدانەوەی شتێك)؛ گۆڕین (مانا)؛ تێکدان
(٥) سپانە؛ ئیسپانە.
*v.t.* (١) بە توندی ڕاکێشان؛ ڕاتەکاندن؛ بە توندی بادان یا وەرگێڕان.
(٢) لە جێ بردن (جومگە، پشت)؛ ڕاتەکاندن و ئازاردان (ماسولکە)؛ وەرگەڕاندن.
(٣) شێواندن (ووتە، ووتار، لێکدانەوەی شتێك)؛ تێکدان (مانا)؛ تێکدان؛ گۆڕین.
**wrest** (rest), *v.t.* (١) ڕاپسکاندن؛ ڕاتەکاندن؛ بە توندی ڕاکێشان؛ بە توندی وەرگێڕان یا بادان؛ بە توندی لێکردنەوە.
(٢) بە زۆر لێ سەندن؛ داگیرکردن؛ بە زۆر لێ دەرهێنان؛ لە دەست هەڵپچڕاندن
(٣) شێواندن (ماناو مەبەستی ڕاستەقینەی شتێك)؛ تێکدان (مانا)؛ گۆڕین.
*n.* (١) ڕاپسکان؛ ڕاتەکان؛ بە توندی وەرگێڕان یا بادان.
(٢) سپانەی کلیلی پیانۆو ئامێری مۆسیقی تر.
**wrestle** (res′'l), *v.i.* (١) زۆران گرتن؛ زۆرانبازی کردن.
(٢) کۆشش کردن؛ زۆر هەوڵدان؛ زۆر خەریك بوون (بۆ چارەکردن)؛ زۆران لەگەڵ گرتن (مەجاز):
*( to ~ with a problem; to ~ with one's conscience)*
*v.t.* (١) (ا) زۆران لەگەڵ گرتن؛ زۆرانبازی لەگەڵ کردن.
(ب) ملەملە لەگەڵ کردن؛ بەربەرەکانی لەگەڵ کردن.
(٢) گوێرەکە دان بە زەویدا بۆ نیشانەکردن یا داغ کردن.
*n.* (١) زۆران؛ زۆران گرتن؛ زۆرانبازی. (٢) ملەملە؛ بەربەرەکانی.
**wrestler** (res′lēr), *n.* زۆرانباز؛ زۆرانگر
**wrestling** (res′liŋ), *n.* زۆرانبازی؛ زۆران گرتن؛ زۆران
**wrest pin,** دوگمەی ئامێری مۆسیقا (کە ژێکانی پێوە بەستراوە).
**wretch** (rech), *n.* (١) کەسێکی کوڵۆڵ و بەدبەخت؛ کەساس؛ داماو؛ نەگبەت؛ هەناسە سارد؛ خەفەتبار. (٢) کەسێکی نزم؛ ناکەس؛ پیس؛ بێ نرخ.
**wretched** (rech′id), *adj.* (١) بەدبەخت؛ کوڵۆڵ؛ کەساس؛ داماو؛ نەگبەت؛ هەناسە سارد؛ خەمبار؛ خەمگین.
(٢) پیس و ناخۆش
*( a ~ home in the slums; ~ weather, food, etc.)*
(٣) خراپ؛ گەند؛ ناپەسەند؛ بێ فەڕ: *( He has done a ~ job.)*
(٤) نزم (مرۆڤ، ڕەووشت، کردار)؛ پیس؛ ناکەس؛ بێ نرخ.

-wretchedly *(adv.)*; wretchedness *(n.)*.

**wrick** (rik), *n.* له جێ چوون (جومگه)؛ ڕاتەکان

*v.t.* له جێ بردن؛ ڕاتەکاندن

**wriggle** (rig′'l), *v.i.* (١) پێچ بە لەشی خۆدا هێنان؛ خۆ کرژکردن؛ لوول خواردن؛ باخواردن؛ پێچ پێدا هاتن. (٢) بە تەکان ڕۆیشتن (کرم، مار). (٣) خۆ پەڕاندنەوە بە فێڵوتەڵەکە؛ خۆبردنەپێشەوە بە فێڵوتەڵەکە؛ خۆ نەدان بە دەستەوە.

*v.t.* (١) پێچ بە لەشی خۆدا هێنان؛ بادان؛ جوڵاندنەوەو یاری پێکردن:
*( to ~ a toe)*

(٢) خۆ بردنە پێشەوە بە فێڵوتەڵەکە؛ خۆ پەڕاندنەوە:
*( He ~d his way into her favor.; He ~d his way out of the crisis.)*

*n.* تەکان؛ جوڵاندنەوەو یاری پێکردن؛ پێچ پێدا هاتن؛ پێچ.

-wriggly *(adj.)*.

**wriggler** (rig′lĕr), *n.* (١) خۆکرژکەر؛ تەکاندەر. (٢) کرمۆکەی مێشوولە.

**wright** (rīt), *n.* دروستکەر؛ سازکەر؛ دارێژ.
*( wheelwright, shipwright, playwright)*

**wring** (riŋ), *v.t.* (١) (ا) وشیر (جلی تەڕ). (ب) دەست وشین بە گەرمی. (٢) ( ~ out ) ئاو لێ چۆڕاندنەوە بە وشین (جل): *( to ~ out clothes)*. (٣) بە توندی بادان. (٤) ( ~ out ) بە زۆر لێ دەرهێنان؛ بە زۆر لێ سەندن:
*( to ~ the truth out of a person; They wrung a confession from the prisoner.)*

(٥) دڵ دەرهێنان؛ سوێ کردن بە دڵدا؛ دڵ وشین؛ خەم و خەفەتێکی زۆر پێدان:
*( Her story wrung their hearts.)*

*v.i.* بە ئازارەوە تلانەوە؛ تەپاوتل کردن؛ خۆ گرمۆڵە کردن.

*n.* ووشین؛ بادان

wring one's hands, دەستی خۆ وشین لە داخ و خەفەت یا دڵشکستیدا؛ دەستەوئەژنۆ دانیشتن؛ دەستەوسان دانیشتن.

**wringer** (riŋ′ĕr), *n.* گوشەر (جلی تەڕ): *( a clothes ~ )*.

**wrinkle** (riŋ′k'l), *n.* (١) چرچولۆچ؛ ژاکاوی؛ ژاکان؛ کرژی؛ چرچ. (٢) چرچولۆچی پێست (وەك هی ناوچەوان یا پیری).

*v.t.* چرچولۆچ کردن؛ ژاکاندن؛ کرژکردن:
*( to ~ clothes, one's forehead, etc.)*

*v.i.* چرچولۆچ بوون؛ چرچ بوون؛ ژاکان.

**wrinkle** (riŋ′k'l), *n.* [Colloq.], (١) شێواز، بیر، یا ڕێیەکی تازەو سەیر (بۆ کردنی شتێك). (٢) کەموکووڕییەکی بچووك:
*( There's a ~ in the plan.)*

**wrinkly** (riŋ′kli), *adj.* چرچولۆچاوی؛ ژاکاو؛ پڕ لە چرچولۆچ.

**wrist** (rist), *n.* (١) مەچەك (٢) مەچەکی کراس و چاکەت و پاڵتۆ؛ سەرقۆڵ؛ سەردەست.

**wristband** (rist′band′, riz′bənd), *n.* (١) سەردەست؛ سەرقۆڵ؛ مەچەکی کراس و چاکەت. (٢) مەچەکبەست. (٣) قایش یا زریزەی کاتژمێر.

**wristlet** (rist′lit), *n.* (١) مەچەکبەست (بە سەردەستەوە دەدووری بۆ گەرموگوڕی)؛ قایش یا زریزەی کاتژمێر. (٢) بازن. (هەروەها " bracelet " ). (٣) کەلەپچە

**wrist-lock** (rist′lok′), *n.* مەچەك گرتن و بادان (زۆرانبازی)

**wrist watch,** کاتژمێری دەست.

**writ** (rit), *n.* (١) [Rare or Archaic] ، نووسراو؛ شتێکی نووسراو؛ بەڵگەنامە. (٢) فەرمانی دادگا.

Holy Writ, = the Bible.

**write** (rīt), *v.t.* ( wrote, written ), (١) نووسین
*( W~ your name.)*

(٢) دانان؛ داڕشتن؛ نووسین:
*( to ~ a book, poem, story, musical composition, etc.)*

(٣) بەڵگەنامەی یاسایی نووسین. (٤) چەك نووسین؛ پڕکردنەوە (ئیستیمارە): *( to ~ someone a check)*. (٥) (نامە) بۆ نووسین؛ پێ ووتن بە نووسین:
*( He wrote that he would be late.)*

(٦) پێ ووتن؛ وا ناوهێنان: *( He ~s himself "Dr." )*. (٧) دیاربوون؛ نووسران؛ ئاشکرابوون:
*( Greed was written on his face.)*

*v.i.* (١) نووسین. (٢) دانان؛ داڕشتن؛ هەڵبەستن؛ نووسین. (٣) نامە نووسین. (٤) بەشێوەیەکی تایبەتی نووسین:
*( He ~s legibly.; This pen ~s well.)*

write down, (١) نووسین؛ تۆمارکردن. (٢) بە سووکی لەسەر نووسین؛ بە خراپە باسکردن. (٣) شکاندن؛ لە پلە کەمکردنەوە. (٤) بەشێوەیەکی ئاسان نووسین؛ ئاسان کردن.

write in, (١) داواکردن بە نووسین یا پۆستە. (٢) ناو نووسین و دەنگدان بۆ کەسێك کە ناوی لە لیستی نامزەدکراواندا نییە بۆ هەڵبژاردن.

write off, (١) بە ئاسانی و بە پەلە نووسین. (٢) سڕینەوە (قەرزێکی نەدراوە کە چاوەڕێی دانەوەی نەکرێ):
*( to write off a debt)*

(٣) لە لیستە دەرهێنان؛ ناو سڕینەوە:
*( to write off a candidate, friend, etc.)*

write out, (١) نووسین؛ تۆمارکردن. (٢) بە تەواوی نووسین؛ هەموو نووسین:
*( to write out an agreement, contract, etc.)*

(٣) زۆر نووسین و هیچ پێ نەمان (نووسەر).

write up, (١) بە دوورودرێژی یا ووردی (لەسەر) نووسین:
*( to write up a report)*

(٢) دوا باس، هەواڵ، یا شت نووسین یا تێخستن:
*( to write up one's diary)*

(٣) پیاهەڵدان بە نووسین؛ ستایش کردن. (٤) نرخ بە زۆر دانان؛ بە زۆر هەڵسەنگاندن یا دانان (مایە).

**write-in** (rīt′in′), *n.* (١) دەنگدان بۆ کەسێکی نامزەدنەکراو بۆ هەڵبژاردن. (٢) کەسێکی نامزەدنەکراو لە لیستەدا بۆ هەڵبژاردن.

*adj.* نووسراو بە دەست (هەڵبژاردن):
*( a ~ candidate; The ~ votes may swing the election.)*

**write-off** (rīt′ôf′), *n.* (١) (ا) قەرز سڕینەوە (دەفتەرگری). (ب) قەرزی سڕاوە (لەبەر نەدانەوەی). (٢) لە باجی دەسکەوت دەرکردن؛ داشکان: *( a tax ~ )*.

**writer** (rīt′ĕr), *n.* (١) نووسەر؛ دانەر. (٢) نووسەر (نامە، تێبینی): *( the ~ of the note)*. (٣) [Scot.]، پارێزەر.

**writer's cramp,** جەمامی نووسەر: بەگیروەستان یا جەمام بوونی دەست و پەنجە بەهۆی زۆر نووسینەوە.

**write-up** (rīt′up′), *n.* (١) ووتاری ڕۆژنامە یا گۆڤارێك (دەربارەی ڕوودان، پرۆژە، کتێب، فیلم... هتد)؛ باسێکی بڵاوکراوە:
*( a favorable ~ about the film; There was a ~ about his dictionary in the newspaper.)*

(٢) بە زۆر دانان یا هەڵسەنگاندنی مایەی کۆمپانیایەك (دەفتەرگری).

**writhe** (rīth), *v.t.* تەپاوتل پێکردن؛ تلاندنەوە؛ گرمۆڵەکردن؛ لوول دان.

*v.i.* (١) تلانەوە بە ئازارەوە؛ تەپاوتل کردن لە ئازاردا؛ خۆ گرمۆڵەکردن؛

پێچ خواردن. (٢) ئێش‌وئازار چەشتن (لە تەریقیدا یا لە شەرمەزاریدا)؛
پێوە تلانەوە (مەجان): [ to ~ under ( or at ) an insult ] .
(٣) بە تەکان و پێچاوپێچ پۆیشتن (وەك کرم و مار).
*n.* تلانەوە (بە ئازارەوە)؛ تەپاوتل کردن؛ لەش کرژبوون؛ پێچ پێدا هاتن.

**writing** (rīt'iŋ), *n.* (١) نووسین. (٢) نووسراو (نامە، بەڵگەنامە... هتد)؛
شتی نووسراو. (٣) شێوەی نووسین: ( Put it in ~ . ) .
(٤) دەست‌رخەت
(٥) بەرهەمی ویژەیی نووسراو (چیرۆك، شانۆگەری، کتێب).
(٦) نووسەری؛ پیشەی نووسەری. (٧) دانان؛ نووسین؛ داڕشتن.
*adj.* هی نووسین: ( ~ material) .
  **in writing,** بە نووسین؛ بە نووسراوی (نەك بە زار).
*( to put something in writing)*
  **the writing on the wall,** = **handwriting on the wall.**

**writing-pad** (rīt'iŋ-pad'), *n.* دەفتەر
**writing paper,** کاغەزی نووسین؛ تیانووس.
**writ of election,** فەرمانی هەڵبژاردن: فەرمانێکە لە میرییەوە بە هەڵبژاردنێکی تایبەتی بۆ پڕکردنەوەی جێگەی چۆڵ.
**writ of error,** فەرمانی (پیاچوونەوەی) هەڵە: فەرمانێکە بۆ دادگایەکی پیاچوونەوە بۆ پیاچوونەوەی بڕیاری دادگایەکی نزمتر و ڕاستکردنەوەی هەڵەکەی
**writ of prohibition,** فەرمانی وازهێنان یا قەدەغە: فەرمانێکە لە دادگایەکی بەرزەوە بۆ دادگایەکی نزم بە وازهێنان لە داواخوازییەك کە ئیتر دراوە بە دادگا بەرزەکە
**writ of right,** فەرمانی ماف: فەرمانی دادگایەکە بە پاراستن یا گەڕانەوەی مافی خاوەنێتی زەوی‌وزار یا خانوو.
**written** (rit''n), *past participle of* **write.**

**wrong** (rôŋ), *adj.* (١) نادروست؛ بەد، ڕەوورشت. کردار؛ خراپ.
(٢) چەوت؛ نەگونجاو: ( This is the ~ method.) .
(٣) ناەجێ؛ نادرووست: ( That was the ~ thing to say.) .
(٤) (ا) هەڵە؛ ڕاست نییە. (ب) بەهەڵەداچوو.
(٥) ناتەواو؛ نەخۆش؛ شکاو؛ باش ئیش ناکات؛ کەم‌وکووڕیدار:
*( Something is ~ with my eyes, my car, etc.)*
*adv.* [illegible]
*n.* [illegible]
(٢) [illegible]
*v.t.* [illegible]
(٢) [illegible]
(٣) [illegible]
-**wrongly** *(adv.)*; **wrongness** *(n.)*.
  **do wrong,** [illegible]
  **do someone wrong,** [illegible]
  **go wrong,** [illegible]
  **in the wrong,** [illegible]

**wrong-doer** (rôŋ'doo'ẽr), *n.* [illegible]
**wrong-doing** (rôŋ'doo'iŋ), *n.* [illegible]
**wrong font,** [illegible]
**wrongful** (rôŋ'fəl), *adj.* [illegible]
*( a ~ act, charge, etc.)*
(٢) [illegible]
-**wrongfully** *(adv.)*; **wrongfulness**
**wrongheaded** (rôŋ'hed'id), *adj.* [illegible]

**wrote** (rōt), *past tense of* **write.**
**wroth** (rôth; Brit. rōth), *adj.* زۆر تووڕە؛ قین هەڵساو.
**wrought** (rôt), *alternative past tense and p.p. of* **work.**
*adj.* (١) دروستکراو؛ کراو؛ پێکهێنراو؛ داڕێژراو: ( carefully ~ ) .
(٢) گەلاڵەکراو (کانزا)؛ بە چەکوشکاری چاك کراو.
(٣) بە ووردی کراو؛ پێویستی بە وورده‌کاری کردووە.
(٤) ڕازاوە؛ نەخشێنراو.
**wrought iron,** ئاسنی نەرم یا بەرگەگر؛ ئاسنی سەختی ساغ؛ ئاسنی گونجاو.
**wrought-up** (rôt'up'), *adj.* هەڵچوو؛ وورووژاو؛ خرۆشاو.
**wrung** (ruŋ), *past tense and past participle of* **wring.**
**wry** (rī), *v.t.* خواروخێچ کردن؛ بادان؛ شێواندن؛ کرژکردن؛ وەرگێڕان.
*v.i.* خواروخێچ بوون؛ خواربوون؛ شێوان.
*adj.* (١) گرژ؛ کرژ؛ بە تەوسەوە: ( a ~ smile) .
(٢) خواروخێچ؛ خوار؛ کەچ: ( a ~ face, neck, mouth, nose, etc.) .
(٣) (ا) چەوت (ڕێبان)؛ هەڵە؛ بەهەڵەداچوو.
(ب) شێواو (مانا، لێکدانەوە)؛ تێکدراو؛ گۆڕاو.
(٤) پێچەوانە؛ دژ؛ سەرسەخت؛ کەللەڕەق.
(٥) ووشك‌و بە تەوسەوە؛ بە توێکڵ:
*( He has a ~ sense of humor.; ~ remarks)*
-**wryly** *(adv.)*; **wryness** *(n.)*.
**wryneck** (rī'nek'), *n.* (١) مل خواری؛ مل گێڕی.
(هەروەها " torticollis " ).
(٢) [Colloq.]، مل خوار: کەسێکی مل گێڕ.
(٣) مل خوار: باڵندەیەکە لە توخمی دارکونکەرە هەمیشە ملی خوار دەگرێ یا وەردەگێڕێ.
**wulfenite** (wool'fən-īt'), *n.* وولفنایت: کانزایەکی بریقەداری ڕەنگاوڕەنگە.
**wurst** (wûrst), *n.* = **sausage.**
**Wyandotte** (wī'ən-dot'), *n.* جۆرە مریشکێکی مام ناوەندی ئەمەریکییە (بۆ هێلکە و گۆشتیش بەخێودەکرێ).
**wye** (wī), *n.* (١) پیتی " Y ". (٢) شتێکە لە شێوەی " Y " دا.
**wyliecoat** (wī'lī-kōt'), *n.* [Scot.], (١) جلی ئەرمی ژێرەوە. (٢) ژێرکراس.
**wyvern** (wī'vẽrn), *n.* = **wivern.**



**X, x** (eks), *n.* (١) تیپی بیست و چوارەمی ئەلف و بێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە " ئێکس ".
(٣) (ا) قالبی ئەم تیپە. (ب) ئەم تیپە بە هەڵکەنراوی یا چاپ کراوی.
(٤) بیست و چوارەم؛ نیشانەی پلە یا ژمارەی بیست و چوارەمی ڕستەیەکە.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی X . (٢) بیست و چوارەم

**X** (eks), *n.* (١) شتێکە لە شێوەی X دا
(٢) نیشانەیەکە بۆ ئەم شتانە بەکاردەهێنرێت: (ا) ئیمزای کەسێکی نەخوێندەوار یا یەکێك کە ناتوانێ بنووسێ. (ب) نیشانەکردنی شوێنێك (لەسەر نەخشەیەك یا نەخشەیەکی ئەندازەیی، هتد...). (ج) نیشانەی ماچە لە نامەدا.
(٣) ژمارە دە (١٠) ی ڕۆمانی.
(٤) کەسێکی نەناسراو؛ شتێکی نەزانراو؛ فلان کەس؛ فلان شت.
(٥) عیسا بەتایبەتی لە ووشەی لێکدراودا وەك: " Xmas " بۆ کورتەی " Christmas " ). (٦) نیشانەیە بۆ " Xenon " (کیمیا).
*adj.* لە X دەکات.

**x** (eks), *n.* (١) سێ ژمارەی نەزانراو (بیرکاری)؛ بڕی نەزانراو
(٢) نیشانەی لێکدان (بیرکاری): ( 2x3 = 6 )

**xanthate** (zan′thāt), *n.* زانتات: خوێی ترشی زانتیك.

**xanthic** (zan′thik), *adj.* (١) زەرد؛ زەردباو (٢) زانتینی؛ زانتین.
(٣) تایبەتی بە ترشی زانتیك

**xanthic acid,** ترشی زانتیك (کیمیا)؛ ترشی زەرد

**xanthin** (zan′thin), *n.* زانتین: ماددەیەکی زەردە لە ناودا ناتوێتەوە لە گوڵی زەردا دەگیرێ.

**xanthine** (zan′thēn, zan′thin), *n.* زانتین: دوێتەیەکی نیترۆجینی سووری یە لە میزو خوێندا هەیە

**Xanthippe** (zan-tip′ē), *n. Also* Xantippe, ژنێکی دەم دڕێژی بێ حەیا

**xantho-** (zan′thō, zan′thə), *Also* xanth-, پێشگرێکە بەمانای زەرد ( xanthochroid ).

**xanthochroid** (zan′thō-kroid′), *adj.* قژ زەرد؛
قژ زەرد و پێست سپی.
*n.* کەسێکی قژ زەرد

**xanthoma** (zan-thō′mə, zan′thō-mə), *n.* نەخۆشییەکی پێستە دەبێتە هۆی چێبوونی لەکە پەڵەی زەرد بەتایبەتی بە پێلووی چاوەوە.

**xanthophyll, xanthophyl** (zan′thō-fil), *n.* زانتۆفیل ڕەنگێکی زەردە لە گەڵا و گوڵ و بەشی زۆری ڕووەکدا هەیە.

**xanthous** (zan′thəs), *adj.* (١) زەرد. (٢) پێست زەرد؛ مەنگۆلی؛ تایبەتی بە گەلە مەنگۆلییەکان

**X chromosome** = sex chromosome.

**xebec** (zē′bek), *n. Also* zebec, zebeck, کەشتییەکی سێ ستوونییە جاران بۆ چەتەیی بەکاردەهێنرا لە دەریای ناوەڕاستدا ئێستاش بۆ بازرگانی.

**xenia** (zē′ni-ə), *n.* کاری هەڵاڵە بۆ سەر چات کردنی تێکەڵ (ڕووەکناسی).

**xeno-** (zen′ō, zen′ə), پێشگرێکە بەمانای: (١) بێگانە؛ نامۆ: *( xenophobia)*
(٢) دەرەکی؛ ناوەکی؛ بێگانە؛ جیا: *( xenolith )* .

**xenogamy** (zi-nog′ə-mi), *n.* چات کردن یا جووت گرتنی تێکەڵ، واتە دوو ڕووەکی جیاواز (ڕووەکناسی). (هەروەها " cross-fertilization " ).

-xenogamous *(adj.).*

**xenogenesis** (zen′ə-jen′ə-sis), *n.* زایینی جیا: بەرهەم هێنانی جۆرە منداڵێك کە هیچ لە دایك و باوکی نەکات.

-xenogenetic *(adj.).*

**xenolith** (zen′ə-lith), *n.* بەردی بێگانە: پارچە بەردێکە چەسپیوەتە ناو جۆرە بەردێکی ترەوە.

**xenon** (zē′non, zen′on), *n.* زینۆن: توخمێکی گازی بێ ڕەنگی قورسە بە ئەندازەیەکی زۆر کەم لە هەوادا هەیە.

**xenophobe** (zen′ə-fōb′), *n.* لە بێگانە ترساو؛ کەسێکە لە بێگانە دەترسێ و ڕقیشی لێیەتی.

-xenophobic *(adj.).*

**xenophobia** (zen′ə-fō′bi-ə), *n.* ترسی بێگانە؛ لە بێگانە ترسان و ڕق لێ بوون.

**xero-** (zêr′ō, zêr′ə), *Also* xer-, پێشگرێکە بەمانای: ووشك: *( xeroderma)*

**xeroderma** (zêr′ə-dûr′mə), *n.* ووشك هەڵاتنی پێست: نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی ووشکبوونەوەو توێك هەڵدانی پێست

**xerography** (zêr′ə-grä′fi), *n.* زیرۆگراف: وێنەگرتنی ووشك.

-xerographer *(n.).*

**xerophilous** (zi-rof′ə-ləs), *adj.* لە ووشکانیدا دەڕوێ یا دەژی؛ بیابانی.

**xerophthalmia** (zêr′of-thal′mi-ə), *n.* ووشکبوونەوەی ژێر پێڵووی چاو (بەهۆی کەمی ڤیتامین " A " ەوە).

**xerophyte** (zêr′ə-fīt′), *n.* ڕووەکی ووشکانی؛ ڕووەکی بیابانی.

-xerophytic *(adj.)*; xerophytically *(adv.).*

**xerosis** (zi-rō′sis), *n.* (١) ووشکبوونەوەی نائاسایی پێست و پێڵووی چاو. (٢) ووشکبوونەوەو لەکارکەوتنی شانەی لەش بەهۆی پیربوونەوە

**xerothermic** (zi-rō′thêr′mik), *adj.* (١) ووشك و گەرم.
(٢) لە شوێنی ووشك و گەرمدا ڕوواو یا ژیاو؛ بیابانی.

**Xerox** (zē-rŏ′ks), *n.* زیرۆکس: (ا) وێنە لەسەر دەرکردن (بە مەکینەی زیرۆکس)؛ ڕوونە، لەبەرگرتنەوە (ب) وێنەی لەبەرگیراوە.
(ج) [X-]. کۆمپانیای زیرۆکس.
*v.t.* (وێنە) لەبەرگرتنەوە؛ وێنە لەسەر دەرکردن:
*( to ~ an article, a booklet, page, document, etc.)*

**-xion** = -(c)tion (British Spelling), (e.g. connexion).

**xiph-** (zif), *Also* xiphi-, xipho-, پێشگرێکە بەمانای شیر، تیغ.

**xiphisternum** (zif′i-stûr′nəm), *n.* (*pl.* -sterna). بەشی لاخواروری ئێسکی نێوسنگ

**xiphoid** (zi′foid), *adj.* (١) شیری؛ بە شێوەی شمشێری
(٢) تایبەتی بە بەشی لاخواروری ئێسکی بەرسنگ
*n.* = xiphisternum.

**Xmas** (kris′məs), *n.* = **Christmas.**
**X-radiation** (eks′rā′di-ā′shən), *n.* (١) چارەکردنی نەخۆشی بە تیشکی ئێکس. (٢) تیشکی ئێکس؛ تیشکی سینی.
**X-rated** (eks′rā′tid), *adj.* (١) بە X نیشانە کراو.
(٢) بێ پەردە (فیلم)؛ باسی جووت بوون دەکات بە ئاشکرا؛ بەرەڵا:
***(an ~ movie)***
**X-ray** (eks′rā′), *adj.* تایبەتی بە تیشکی ئێکس؛ بە تیشکی ئێکس گیراو
***v.t.*** وێنەگرتن بە تیشکی ئێکس؛ چارەکردن بە تیشکی ئێکس.
**X ray,** (١) تیشکی ئێکس؛ تیشکی سینی؛ تیشکی نەزانراو.
(٢) وێنەی بە تیشکی ئێکس گیراو؛ وێنەی تیشکی ئێکسی.
**xylan** (zī′lan), *n.* زایلان ماددەیەکی زەردی لینجە لە شانەی دارینی دارو درەختدا.
**xylem** (zī′lem), *n.* زایلیم بەشی ڕەقی دارو درەخت (وەك قەدو لقەکانی)؛ ماددەی ڕەق لە لق و قەدی ڕووەکدا.
**xylene** (zī′lēn), *n.* زایلین ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی بسووتە لە بەنزین دەچێ لە قەترانی خەڵووز دەردەهێنرێت (بۆ ڕەنگ کردن بەکاردێت).
**xylic acid,** ترشی زیلین (کیمیا).
**xylidine** (zī′lə-dēn′, zil′ə-din), *n. Also* **xylidin,** زایلیدین: ئاوێتەیەکە لە " زایلین " وەردەگیرێت. (ووشەی پێشوو ببینە).
**xylo-** (zī′lō, zī′lə), *Also* xyl-, پێشگرێکە بەمانای. دار؛ تەختە؛ دارین. ***(xylograph)*** .
**xylograph** (zī′lə-graf′, zī′lə-gräf′), *n.* زایلۆگراف: نەخشی لە دار هەڵکەنراو؛ وێنەی ئەم نەخشە.
**xylography** (zī-log′rə-fi), *n.* زایلۆگرافی: نەخش لەسەر دار هەڵکەندن و وێنەگرتنی.
**-xylographer** *(n.)*; **xylographic; xylographical** *(adj.)*.
**xyloid** (zī′loid), *adj.* داری؛ دارین؛ لە دار دەچێ.
**xylol** (zī′lōl, zī′lol), *n.* = **xylene.**
**xylophagous** (zī-lof′ə-gəs), *adj.* دارو تەختە خۆر (وەك مۆرانەو مێرووی تر)
**xylophone** (zī′lə-fōn′, zil′ə-fōn′), *n.* زایلۆفۆن؛ زیلۆفۆن: ئامێرێکی مۆسیقایی دارینە لە سەنتوور دەچێ بریتیەیە لە ڕیزێك داری پلە پەیژەیی بە دوو چەکوشی داری بچووك لێ دەدرێ.
**-xylophonist** *(n.)*.
**xylose** (zī′lōs), *n.* زایلۆس؛ زیلۆس: شەکری تەختە.
**xylotomous** (zī-lot′ə-məs), *adj.* دارکونکەر (مۆرانە، مێروو).
**xylotomy** (zī-lot′ə-mi), *n.* بڕین و ئامادەکردنی بڕگەی تەنکی دار بۆ تێڕوانین بە گەردبین.
**-xylotomic** *(adj.)*.
**xyst** (zist), *n. Also* **xystum, xystus,** (١) دالان: ڕاڕەوی سەر گیراو. (٢) ڕاڕەوی ناو باخچە.
**xyster** (zis′tēr), *n.* ئامێری ئێسقان کڕاندن (پزیشکەوانی، نەشتەرکاری).

# Y y

**Y, y** (wī), *n.* (١) تیپی بیست و پێنجەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزییە.
(٢) دەنگی ئەم تیپە " وای ".
(٣) (ا) قاڵبی ئەم تیپە. (ب) ئەم تیپە بە هەڵکەنراوی یا چاپ کراوی.
(٤) بیست و پێنجەم؛ نیشانەی پلە یا ژمارەی بیست و پێنجەمی ڕستەیەکە.
*adj.* (١) تایبەتی بە تیپی Y. (٢) بیست و پێنجەم.
**Y** (wī), *n.* (١) شتێکی دوو پەل لە شێوەی Y دا (وەك كۆڵەكە، بۆری...).
(٢) نیشانەی سەد و پەنجای ڕۆمانی کۆنە.
*adj.* وەك " Y ".
**y,** (١) ژمارە یا بڕی نەزانراو (بیرکاری). (٢) **ordinate**.
**-y** (i), پاشگرێکە مانای خۆشەویستی یا بچووك کردنەوە دەگەیەنێ:
*( daddy, kitty)*
**-y** (i), پاشگرێکە بەمانای: (ا) وایە؛ پڕ لە؛ هەیەتی: *( dirty, healthy)*.
(ب) نەختێ؛ تۆزێ: *( yellowy, chilly)*.
(ج) خوازا؛ مەیلە و نەوەیە: *( sleepy, sticky)*.
(د) لەوە دەچێت؛ - ی: *( wavy)*.
**-y** (i), پاشگرێکە بەمانای: بوون؛ بارودۆخ؛ چۆنێتی: *( jealousy)*.
**-y** (i), پاشگرێکە بەمانای: کردار؛ کردن؛ – کاری:
*( inquiry, entreaty)*
**yacht** (yät), *n.* یەخت؛ کەشتی یا بەلەمی گەورەی شۆخی گەشت.
*v.i.* سواری یەخت بوون؛ بە یەخت گەڕان یا گەشت کردن.
**yachting** (yät′iŋ), *n.* سواری یەخت بوون؛ گەڕان یا گەشت کردن بە یەخت.
**yachtsman** (yäts′mən), *n.* خاوەن یەخت؛ یەختەوان؛ یەخت لێخوڕ.
-**yachtsmanship** *(n.)*.
**yagi** (yä′gē), *n.* هەوایی (رادیۆ و تەلەفزیۆن).
**yah** (yä, ya), *adv.* [Colloq.], = **yes.**
**yahoo** (yä′hōō, yā′hōō, ya-hōō′), *n.* (١) زرتەبۆز؛ جلفڕ؛ کەرتڕ؛ نەزان. (٢) [Y-]. بوونەوەرێکە لە شێوەی مرۆڤدا و بە هەموو ناپەسەندییەکانی مرۆڤەوە (لە چیرۆکی " گەلیڤەرز ترافلز " ی ئینگلیزیدا).
**Yahweh, Yahwe** (yä′we), *n.* یاوە: خوای جوولەکەکان؛ خوا.
**yak** (yak), *n.* یاك: گایەکی " تبت " ی کێوی تووك درێژە (ماڵیش دەکرێ).
**yak, yack** (yak), *v.i.* [Slang], نۆرووێژی کردن؛ چەنە دان؛ چەنەبازی کردن
*n.* چەنەبازی؛ دەمەوەری؛ نۆرووێژی؛ چەڵتە چەڵت.
**yam** (yam), *n.* یام: جۆرە پەتاتەیەکی شیرینی سوورە.

**yamen** (yä′mən), *n.* بارەگای مەی یا فەرمانڕەوایەکی چین (لە سەردەمی ئیمپڕ تۆرییدا)؛ سەرا.
**yammer** (yam′ẽr), *v.i.* [Colloq. or Dial.]. (١) بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵاکردن؛ نووزەنووز کردن (٢) قیڕەقیڕ کردن؛ قیڕاندن؛ هاوار کردن.
*v.t.* بۆڵەبۆڵ کردن؛ سکاڵاکردن؛ نووزەنووز کردن.
*n.* بۆڵەبۆڵ؛ سکاڵا؛ نووزەنووز.
**yang, Yang** (yaŋ), *n.* یانگ: هێزی نێر یا نێرینە لە جیهان و ژیاندا (فەلسەفەی چینی) (ووشەی " **yin** " یش ببینە).
**Yank** (yaŋk), *n.* [Slang], = **Yankee.**
**yank** (yaŋk), *v.t. & v.i.* ڕتەکاندن؛ لەپڕ ڕاکێشان یا دەرهێنان:
***( He ~ed out a loose tooth.; He ~ed his child out of school.)***
*n.* ڕتەکان؛ لەپڕ ڕاکێشان یا دەرهێنان.
**Yankee** (yaŋ′ki), *n.* یانکی: (١) هاونیشتمانییەکی " نیو ئینگلەند "، واتە " ئینگلتەرەی تازە "، کە بریتییە لە ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکا
(٢) (ا) هاونیشتمانییەکی ناوچەی باکووری ئەمەریکا؛ باکووری.
(ب) سەربازێکی لەشکری " یەکێتی "ی شەڕی براکوژی ئەمەریکا.
(٣) ئەمەریکی؛ ئەمەریکایی.
*adj.* تایبەتی بە " یانکی "؛ ئەمەریکی.
**Yankeedom** (yaŋ′ki-dəm), *n.* (١) گشت " یانکی ".
(٢) ناوچە باکوورییەکانی ئەمەریکا بەتایبەتی بەشی باکووری ڕۆژهەڵات کە پێی دەووترێ " نیو ئینگلەند ". (٣) ئەمەریکا (ووشەی پێشوو ببینە).
**Yankee Doodle** (dōō′d'l), (١) یانکی دوودڵ: گۆرانییەکی ئەمەریکییە لە سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی ئەمەریکادا باوبوو.
(٢) یانکی؛ ئەمەریکی.
**Yankeeism** (yan′ki-iz'm), *n.* (١) یانکییەتی؛ نەریت و خووی یانکی. (٢) خوو، کردەوە، یا شتێکی یانکییانە؛ ووتەیەك یا جۆری دووانێکی تایبەتی بە یانکی.
**yard** (yärd), *n.* (١) یارد: ئەندازەیەکە بریتییە لە ٣ پێ یا ٣٦ گرێ یا ٠,٩١٤ مەتر؛ یاردە. (٢) شیشە دارێکی ئاسۆییە بۆ ڕاگرتنی بایەوانی کەشتی و بەلەم.
**yard** (yärd), *n.* (١) حەوشە: *( churchyard)*.
(٢) مەیدان (بەتایبەتی کە شوورە کرا بێ بۆ ئیشێکی تایبەتی)؛ گۆڕەپان:
*( brickyard, shipyard)*
(٣) مەیدانی هێڵی ئاسن: شوێنێکە لە تەنیشت ئێستگەی شەمەندەفەرەوە چەندەها هێڵی ئاسنی تێدا ڕاکێشراوە بۆ شەمەندەفەر چاك کردن و ئاڵوگۆڕ کردن و ئامادەکردن... (٤) لەوەڕگای ئاسکە کێوی و گیانداری وەها.
(٥) پەچە؛ کۆز.
*v.t.* ( ~ up), کردنە پەچەوە.
*v.i.* کۆبوونەوە (لە مەیدانێکدا)؛ گردبوونەوە.
**yardage** (yär′dij), *n.* (١) (ا) ئەوەندە یارد. (ب) درێژی، پانی، یا قەوارەی شتێك بە یارد؛ سەرجەمی یارد. (٢) کووتاڵی بە یارد فرۆشراو.
**yardage** (yär′dij), *n.* (١) بەکارهێنانی پەچەی ئێستگەی شەمەندەفەر (بۆ ئاژەڵ حەواندنەوە تا کاتی گوێزانەوەیان). (٢) کرێی ئەم بەکارهێنانە.
**yardarm** (yärd′ärm′), *n.* ئەمسەرو ئەوسەری شیشەداری ئاسۆیی بایەوانی کەشتی.
**yard goods,** شتوومەکی بە یارد فرۆشراو (وەك کووتاڵ).
**yard grass,** گیای حەوشە: گیایەکی ساڵانەی زبرو نووك دڕکاوییە.
**yard-man** (yärd′mən), *n.* کارگەری مەیدانی هێڵی ئاسن.
**yard-master** (yärd′mas′tẽr, yärd′mäs′tẽr), *n.* کارگێڕی مەیدانی هێڵی ئاسن.
**yardstick** (yärd′stik′), *n.* (١) دارێکی پێوانەیی پلە پلەیە درێژییەکەی یاردێکە؛ یارد. (٢) سەنگی محەك؛ پێوانە؛ پێوانەی تاقیکردنەوە و بەراورد کردن
**yard-wand** (yärd′wänd′, yärd′wônd′), *n.* = **yardstick.**
**yare** (yâr), *adj.* [Archaic or Dial.], (١) ئامادە.

(٢) چاپك؛ گورج وگوڵ؛ چالاك. (٣) لێخوڕینی ئاسانەو باش دەڕوات (كەشتی)
*adv.* [Obs.], یەكسەر؛ خێرا؛ دەمودەس.
**yarn** (yärn), *n.* (١) ڕێس؛ دەزوو؛ بەن.
(٢) [Colloq.]، چیرۆك (بەتایبەتی هی دوورودرێژو پێ لێ هەڵبڕاو)؛ سەرگوروشتە؛ سەرگوزەشتە.
*v.i.* [Colloq.], چیرۆك گێڕانەوە (بە پێوەنانەوە)؛ هۆنینەوە (چیرۆك).
**spin a yarm,** چیرۆك گێڕانەوە (بە پێوەنانەوە)؛ هۆنینەوە (چیرۆك)؛ دەماندن
**yarn-dyed** (yärn'dīd'), *adj.* بە ڕێسی لە خوم دراو (واتە پێش چنین).
**yarrow** (yar'ō), *n.* ڕووەكێكە گەڵاكانی بچووكو بۆن و تام تیژن. (هەروەها " milfoil ").
**yashmak, yashmac** (yäsh-mäk', yash'mak), *n.* یەشماغ؛ پەچە
**yataghan, yatagan** (yat'ə-gan, yat'ɔ-gən), *n.* شمشێرێكی كورت و كووڕی توركییە.
**yauld** (yôd, yäd, yäld), *adj.* [Scot.], گورج وگوڵ؛ چاپك؛ چالاك.
**yaupon** (yô'pən), *n.* درەختێكی بەر سووری هێشوویییە گەڵاكەی هەندێ جار وەك چا بەكاردەهێنرێت.
**yaw** (yô), *n.* (١) لە ڕێ لادان (كەشتی، بەلەم).
(٢) بە خواروخێچی ڕۆیشتن. (٣) لە ڕێ لادان (فڕۆكە، گوللە، مووشەك).
*v.t.* لادان لە ڕێی خۆ.
*v.i.* (١) لە ڕێ لادان. (٢) گۆشەی ئەم لادانە.
**yawl** (yôl), *n.* (١) jolly-boat . (٢) بەلەمی بایەوانی بچووك.
**yawl** (yôl), *n. & v.i.* [Dial.], yowl.
**yawn** (yôn), *v.i.* (١) باوێشك دان.
(٢) كرانەوە؛ دەم داچەقان (مەجاز):
*( a ~ing chasm, fissure, gulf, etc.)*
*v.t.* بە باوێشك دانەوە وتن: *( She ~ed a reply.)* .
*n.* (١) باوێشك (٢) دەلاقە؛ كون یا قلیشێكی گەورە.
**make a person yawn,** ماندوو كردن یا بێ تاقەت كردن بە قسەی ناخۆش و بێ تام.
**yawp, yaup** (yôp, yäp), *v.i.* (١) هاوار كردن؛ قیژاندن؛ وەڕین.
(٢) [Slang]، هەڵەوەڕی كردن؛ قسەی قۆڕو بێ تام كردن بە دەنگی بەرز.
(٣) [Colloq.]، باوێشك دان بە دەنگی بەرز.
*n.* (١) هاوار؛ قیژە؛ وەڕە؛ وەڕین.
(٢) [Slang]، هەڵەوەڕی؛ قسەی بێ تام بە دەنگی بەرز.
**yaws** (yôz), *n.pl.* درمێكی پێستی ناوچە گەرمەكانە دەبێتە هۆی پیزۆكەو برینی پێست.
**Y chromosome,** كرۆموسۆمی نێر.
(ووشەی " sex chromosome " ببینە).
**y-clept** (i-klept'), *past participle of* **clepe.**
*adj.* [Archaic], ناوی رایە؛ وای پێ دەڵێن؛ ئەوە ناوێتی.
**yd.,** = yard. (پێوانە)
**ye** (*thē, thə, thi*), *adj.* [Archaic], = the.
**ye** (yē; *unstressed* yi), *pron.* (١) [Poetic & Archaic]، ئێوە. (٢) [Dial.]، تۆ.
**yea** (yā), *adv.* (١) بەڵێ؛ ئەرێ؛ ئا؛ ئێ.
(٢) بە ڕاستی؛ بێگومان؛ ئەگەر ڕاستت دەوێت
(٣) [Archaic]، نەك هەر ئەوە بەڵكو ئەوەیش؛ زیاد لەوەیش.
*( He was a good, ~ , fine man.)*
*n.* (١) ئەرێ، دەنگدان بە [illegible]؛ دەنگی [illegible]
*( the Y~s and the Nays)*
(٢) دەنگدەر بە " ئا "؛ ئەو كەسەی دەنگ دەدات بە پەسەند كردن یا بە [illegible] پێشنیازێك.

**yeah** (ye, ya), *adv.* [Colloq.], = yes.
**yean** (yēn), *v.t. & v.i.* زایین (مەڕو بزن)؛ زان.
**yeanling** (yēn'liŋ), *n.* بەرخ؛ كار.
*adj.* بەچكە؛ شیرەخۆرە؛ ساوا
**year** (yêr), *n.* (١) ساڵ.
(٢) (*pl.*) (ا) تەمەن: *( He seems old for his ~s.)* .
(ب) كاتێكی زۆر؛ دەمێك؛ كات: *( She died ~s ago.)* .
**year after year,** ساڵ لە دوای ساڵ؛ هەموو ساڵ.
**year by year,** ساڵ بە ساڵ.
**year in, year out,** هەموو ساڵ؛ هەموو ساڵێك.
**yearbook** (yêr'book'), *n.* كتێبی ساڵانە: كتێبێكە ساڵی جارێك دەردەچێ و زانیاری دەربارەی ساڵی ڕابوردووی دەزگایەكی تێدا بڵاودەكرێتەوە بە وێنەوە (بەتایبەتی قوتابخانەو زانكۆ): *( a college ~ )* .
**yearling** (yêr'liŋ, yũr'liŋ), *n.* (١) ساڵەوەختە؛ گیانداری یەك ساڵە.
(٢) جوانووی یەك ساڵە.
*adj.* یەك ساڵە.
**yearlong** (yêr'lôŋ), *adj.* بە درێژایی ساڵ.
**yearly** (yêr'li), *adj.* ساڵانە؛ ساڵی؛ هەر ساڵی جارێك: *( a ~ event)* .
*adv.* ساڵانە؛ هەموو ساڵێك؛ ساڵی جارێك: *( This contest happens ~ .)*.
*n.* بڵاونامە یا بڵاوكراوەیەكی ساڵانە؛ ساڵنامە.
**yearn** (yũrn), *v.i.* (١) ( ~ for; ~ after ) زۆر بیركردن؛ بە پەرۆشەوە بوون؛ بۆ بە تاسەوە بوون؛ ئارەزوو كردن:
*( He ~ed for the old familiar faces and places.)*
(٢) بەزەیی پێدا هاتنەوە؛ دڵ پێ سووتان.
**yearning** (yũr'niŋ), *n.* تاسە؛ پەرۆش؛ ئارەزوو؛ بیركردن.
*adj.* هی تاسە یا ئارەزوو: *( a ~ sigh, look, etc.)* .
-yearningly *(adv.)*.
**year-round** (yêr'round'), *adj.* بە درێژایی ساڵ.
**yeast** (yēst), *n.* (١) هەوێن؛ هەویرترش. (٢) ڕووەكێكی یەك خانەیی كەڕوویییە دەبێتە هۆی خێراكردنی كارلێكی كیمیایی وەك ترشان. (٣) كەف.
*v.i.* (١) ترشان. (٢) كەف كردن.
**yeasty** (yēs'ti), *adj.* (١) هەوێنی؛ هەویرترشی. (٢) كەفاوی.
(٣) هیچ وپووچ؛ ڕووكاری: *( ~ writing)* .
(٤) دانەمركاو؛ وورووژاو؛ بێ ئارام
-yeastiness *(n.)*.
**yegg** (yeg), *n.* [Slang], *Also* **yegg-man,** دز؛ماڵبڕ؛ قاسەبڕ؛ قاسەشكێن.
**yelk** (yelk), *n.* [Archaic or Dial.], = yolk.
**yell** (yel), *n.* قیژاندن؛ هاواركردن؛ شیڕاندن؛ نەڕاندن.
*n.* (١) قیژە؛ هاوار؛ شیڕە؛ نەڕە.
(٢) قیژەی بە كۆمەڵ بۆ هاندان (وەك لە یاریگادا): *( a college ~ )* .
**yellow** (yel'ō), *adj.* (١) زەرد. (٢) (ڕەنگ، زەرد هەڵگەڕاو.
(٣) پێست زەرد (وەك گەلە مەنگۆلییەكان). (٤) [Colloq.]، ترسنۆك؛ نامەرد.
(٥) وورووژێنەر؛ لە هەواڵی نابڕووبەرو سووك دەكەڕێ (ڕۆژنامە)؛ دەنگوباسی پیس بڵاوكەرەوە: *( ~ journalism)* .
*n.* (١) ڕەنگی زەرد؛ زەرد. (٢) بۆیەی زەرد. (٣) زەردێنەی هێلكە.
(٤) نەخۆشییەكە دەبێتە هۆی زەرد هەڵگەڕانی گەڵای ڕووەك.
(٥) (*pl.*) زەردوویی (بەتایبەتی لە ئاژەڵدا). (٦) [Obs.]، دڵ پیسی
*v.t.* زەرد كردن؛ (ڕەنگ، زەرد هەڵگەڕاندن.
*v.i.* زەرد بوون؛ (ڕەنگ) زەرد هەڵگەڕان.
-yellowness *(n.)*.
**yellowbird** (yel'ō-bûrd'), *n.* حەوت ڕەنگییە؛ مێرەخورە.
**yellow-dog contract** (yel'ō-dôg'), پەیمانێكی نێوان كرێكارو خاوەن ئیشە بە ڕێ نەدان بە كرێكارەكە بە بوونە ئەندامی یەكێتی كرێكاران.
**yellow fever,** زەردەتا: درمێكی ناوچە گەرمەكانە لە مێشوولەوە

دانەکەی‌و دەبێتە هۆی زەردوویی‌و تاو ڕشانەوە... هتد.

**yellow-hammer** (yel′ō-ham′ẽr), *n.* (١) فیرنەگولەیەکی سەرو ملو سنگ زەردە. (٢) دارکونکەرەیەکی پەڕو باڵ زەردە.

**yellowish** (yel′ō-ish, yel′ə-wish), *adj.* زەردباو؛ زەردکار.

**yellow jack,** (١) yellow fever.
(٢) ئاڵای زەرد (کەشتی‌یەك هەڵی دەکات کە کەرەنتینە کرابێت).
(٣) ماسی‌یەکی ڕەنگ زیوی‌و ئاڵتوونی‌یە.

**yellow jacket,** زەردەزیرە.

**yellow jasmine,** یاسەمینی زەرد

**yellow journalism,** ڕۆژنامەگەری زەرد: ڕۆژنامەگەری‌یەکە کە هەر بە شوێن هەواڵی ئابڕووبەرو سووکدا دەگەڕێ‌و بڵاوی دەکاتەوە (لە مەرەکەبی زەرد بەکارهێنانەوە هاتووە بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵك).

**yellow-legs** (yel′ō-legz), *n.* لاق زەردە: باڵندەیەکی قەراغ ئاوی لاق درێژو زەردە

**yello metal,** کانزای زەرد: (ا) زێڕ؛ ئاڵتوون.
(ب) دارشتەیەکە لە سەدا شەستی مسی زەردەو لە سەدا چلی چینکۆ.

**yellow peril,** مەترسی زەرد: ئەو مەترسی‌یەیە کە گوایە لە گەلە پێست زەردەکانەوەیە (وەك: چینی، یابانی، کۆریایی، هتد...) بۆ جێ پێ لەق کردنی گەلە سپی‌یەکان‌و دەست بەسەر جیهاندا گرتن.

**yellow pine,** (١) کاجی زەرد
(٢) دارو تەختەی ئەم جۆرە کاجە.

**yellow race,** ڕەگەزی زەرد: کە چینی‌و یابانی‌و کۆری‌و مەنگۆلی‌و... هتد دەگرێتەوە؛ ڕەگەزی مەنگۆلی

**yellow streak,** دەماری ترسنۆکی؛ مەیلی ترسنۆکی

**yellow-tail** (yel′ō-tāl′), *n.* کلك زەرد: چەند جۆرە ماسی‌یەکی کلك زەردباون

**yellow-throat** (yel′ō-thrōt′), *n.* قورتم زەرد: فیرنەگولەی- ئەمەریکی

**yellow warbler,** فیرنەگونە زەردە: باڵندەیەکی ئەمەریکی‌یە

**yellow-weed** (yel′ō-wēd′), *n.* چەند جۆرە گیایەکی گوڵ زەردن.

**yellow-wood** (yel′ō-wood′), *n.* تەختە زەرد: چەند جۆرە درەختێکی ئەمەریکین تەختەکەیان زەردبەوەو گەڵاکەیان ڕەنگی لێ دەگیرێت.

**yellowy** (yel′ō-i, yel′ə-wi), *adj.* زەردباو؛ زەردکار.

**yelp** (yelp), *v.i.* (١) قرووسکان: حەپاندن (بە ئازارەوە)؛ حەپەکردن.
(٢) ناڵاندن.
*n.* قرووسکە: قرووسکان؛ حەپ.
*( The dog gave a ~ when I stepped on its tail.)*
-yelper *(n.)*.

**yen** (yen), *n.* [illegible]

**yen** (yen), *n.* [Colloq.] [illegible]
*v.i.* [Colloq.] [illegible]

**yeoman** (yō′mən), *n.* (١) [illegible]
[illegible]
(ب) [illegible]
(٢) yeoman of the guard [illegible]
(ب) [illegible]
(٣) [illegible]

**yeomanly** (yō′mən-li), *adj.* (١) [illegible]
[illegible]
*adv.* [illegible]

**yeoman of the (royal) guard,** [illegible]

**yeomanry** (yō′mən-ri), *n.* (١) [illegible]
[illegible]

**yeoman's service,** [illegible]
[illegible]

**yep** (yep), *adv.* [Slang], = yes.

**yes** (yes), *adv.* (١) بەڵێ؛ ئەرێ؛ ئا؛ نێ؛ با.
(٢) زیاد لەوەیش؛ سەرەڕای ئەوەیش:
*( I shall be ready, ~ , eager to help you.)*
(٣) " yes " گەلێ جار وەك پرسیاریش بەکاردەهێنرێت بەمانای " چی ؟ "، " هیچی ترت هەیە بیڵێی؟ "، " وا نی‌یە ؟ "، " وایە؟ ":
*( The taxes are reasonable. Y~?; We must all contribute what we can. Y~?)*
*n.* (١) ئەرێ؛ بەڵێ؛ ئا؛ وەڵامی پەسەندی یا ئەرێ.
(٢) دەنگی پەسەندکردن (کۆی)؛ دەنگی " ئەرێ " یا " بەڵێ "؛ دەنگدەر بە " ئەرێ " (کۆبوونەوەی ئەنجوومەن). (هەروەها " aye " بەم مانایە).
*v.t. & v.i.* پەسەندکردن؛ قایل بوون؛ وەڵام دانەوە بە " بەڵێ ".

**yes-man,** [Slang], کەسێکە سەرۆکەکەی هەر شتێك بڵێ لەگەڵ ئەوەیە؛ نۆکەر؛ کلکەلەقێکەر.

**yester-** (yes′tẽr), *(yesterday)* پێشگرێکە بەمانای: (ا) دوێنێ؛ هی دوێنێ:
(ب) ڕابوردوو؛ پێشوو: *(yesteryear)*.

**yesterday** (yes′tẽr-di, yes′tẽr-dā′), *n.* (١) دوێنێ؛ دوێکە.
(٢) لەم دوایی‌یەدا؛ تازە؛ لەم بەینەی پێشوودا.
*adv.* (١) دوێنێ؛ دوێکە. (٢) لەم دوایی‌یەدا؛ تازە.
*adj.* دوێنێ؛ هی دوێنێ: *(~ morning)*.

**yestereve** (yes′tẽr-ēv′), *n. & adv.* [Arch. or Poetic], دوێنێ ئێوارە؛ دوێنێ شەو.

**yesterevening** (yes′tẽr-ēv′niŋ), *n. & adv.* [Arch. or Poetic], = yestereve.

**yestermorn** (yes′tẽr-môrn′), *n. & adv.* [Arch. or Poetic], دوێنێ بەیانی.

**yestermorning** (yes′tẽr-môr′niŋ), *n. & adv.* [Arch. or Poetic], = yestermorn.

**yestern** (yes′tẽrn), *adj.* [Archaic],= yester.

**yesternight** (yes′tẽr-nīt′, *n. & adv.* [Archaic or Poetic], دوێنێ شەو.

**yesteryear** (yes′tẽr-yẽr′), *n. & adv.* [Arch. or Poetic], (١) پار؛ساڵی پار. (٢) ساڵی ساڵان؛ جاری جاران؛ جاران.

**yestreen** (yes-trēn′), *n. & adv.* [Scot. or Poetic], دوێنێ شەو؛ دوێنێ ئێوارە.

**yet** (yet), *adv.* (١) هێشتا؛ جارێ؛ تا ئەو کاتە:
*( They have not ~ finished eating.; They had not ~ left.)*
*( We can't leave just ~.)* (٢) ئێستا؛ جارێ.
(٣) هێشتا؛ ئێستاش؛ [illegible]
*( There is ~ a chance for peace.)*
*( I could hear the screams ~.)* (٤) ئێستاش
*( It is strange, ~ true.)* (٥) لەگەڵ ئەوەشدا.
*( They may ~ get what they want.)* (٦) [illegible]
*( He did not come, nor ~ write.)* (٧) [illegible]
*( She was lovely, ~ stupid.)* (٨) بەڵام
*conj.* کەچی؛ [illegible]
*( He worked very hard, ~ he failed.)*
[illegible]

**yew** (yū), *n.* (١) [illegible]
[illegible] (٢) [illegible]
(٣) [illegible]

**Yiddish** (yid′ish), *n.* [illegible]
[illegible]
[illegible]

**adj.** (١) تایبەتی بەم زەمانە؛ ییدی.
(٢) [Slang]، هی جوولەکە؛ جوولەکە؛ جوو.

**yield** (yēld), ***v.t.*** (١) (ا) بەرگرتن؛ بەردان؛ هاتنە بەر؛ بەرهەم دان؛ قازانج کردن
***( A tree ~s fruit.; Our orchard ~ed a good crop this year.; Your money ~s 4% in the bank now.)***
(ب) ئەنجام دان بەدەستەوە؛ بەرهەم بوون:
***( Their advice to us ~ed many benefits.)***
(٢) بەدەستەوەدان؛ دەست لێ هەڵگرتن؛ خۆ بەدەستەوەدان:
***( to ~ ground to the enemy.; He ~ed himself up to pleasure.)***
(٣) پێدان؛ پێ بەخشین؛ دان پیانان:
***( He ~ed his consent. to ~ a point in a debate)***
(٤) [Archaic]، بۆ بژاردن؛ پێدان لەبری.
***v.i.*** (١) هاتنە بەرهەم؛ بەرگرتن؛ سوود بوون.
(٢) بەدەستەوەدان؛ دەست هەڵگرتن؛ وازهێنان:
***( We are determined never to ~ .)***
(٣) پسان؛ رووخان؛ بەرگە نەگرتن؛ شکان؛ هەرەس بردن.
(٤) ( to ~ ) نۆرەی خۆ پێدان؛ سەرەی خۆ پێدان؛ ڕێ پێدان؛ مل بۆ کەچ کردن(لە ڕووی ڕێزەوە):
***( to ~ to a senior person, a driver on the road,etc.)***
***n.*** (١) بڕشت؛ بەر؛ بەرهەم؛ بەروبووم:
***( What is the ~ of wheat per acre? )***
(٢) سوود؛ قازانج؛ دەسکەوت:
***( The ~ on investments is low nowadays.)***
**-yielder *(n.)*.**

**yielding** (yēl′diŋ), ***adj.*** مل کەچ؛ دەستەمۆ؛ مالی؛ گوێ ڕایەڵ:
***( a ~ disposition)***
**-yieldingly *(adv.)*;** yieldingness ***(n.)*.**

**yin** (yin), ***n.*** ین: هێزی مێ یا مێینە لە جیهاندا (فەلسەفەی چینی).
(ووشەی " yang " یش ببینە).

**yip** (yip), ***n.*** قرووسکە قرووسکی سەگ؛ حەپە حەپی یەك لە دوای یەك.
***v.i.*** قرووسکاندن؛ حەپاندن پەیتا پەیتا.

**yipe** (yīp), ***interj.*** ووتەیەکە ترس، ئازار، یا سەرسامی دەردەبڕێت.

**yippie** (yip′i), ***interj.*** یپی‌یی!: قریوەی خۆشی‌یە.

**yird** (yūrd), ***n.*** [Scot.],= **earth.**

**ylang-ylang** (ē′läŋ- ē′läŋ), ***n. Also* ilang-ilang**, (١) دارێکی ناوچە گەرمەکانی ئاسیایە گوڵی زەردی سەوزباوی بۆن خۆش دەگرێ.
(٢) بۆنێکە لە گوڵی ئەم درەختە دەگیرێ‌و بۆنی خۆشی لێ دروست دەکرێ؛ ئەم بۆنە

**yodel, yodle** (yō′d'l), ***v.t. & v.i.*** گۆرانی ووتن بە دەنگی بەرزو بەرەبەرە نزم کردنەوە.
***n.*** گۆرانی‌یەکە وەك هۆرە دەنگی تێدا بەرزو نزم دەکرێتەوە.
**-yodeler *(n.)*; yodler *(n.)*.**

**yoga** (yō′gə), ***n.*** یۆگە: (ا) فەلسەفەیەکی هیندی‌یە بریتی‌یە لە بیرکردنەوە و خۆراگرتن‌و مێشکی خۆ پاك کردنەوە لە بیری زیانبەخش بۆ نزیکبوونەوە لە گیانی خوایی. (ب) وەرزشێکە بۆ لەش‌و مێشك ساغی‌و هێنانەدی ئەم فەلسەفەیە

**yogi** (yō′gi), ***n. Also* yogin,** یۆگی: پەیرەوی کەری " یۆگە ". (ووشەی پێشوو ببینە)

**yogurt, yoghurt** (yō′goort), ***n.*** ماست.

**yoicks** (yoiks), ***interj. Also* hoicks,** [British], قریوەی ڕاوچی‌یە بۆ سەگو تانجی تێ کردن لە ڕاوە ڕێویدا.

**yoke** (yōk), ***n.*** (١) نیلە. (٢) جووتە گا؛ جووت. ***( a ~ of oxen)***
(٣) نیشانەی بەندایەتی؛ نیشانەی بەندەگی
(٤) زۆرداری؛ بەندیتی؛ باری قورس؛ دیلێتی؛ بەندەگی:
***( the ~ of a tyrant; to throw off the ~ of servitude)***
(٥) پەیوەندی: ***( the ~ of brotherhood; the marriage ~ )*** .
(٦) شتێکە کە لە نیلە بکات: (ا) شان چێو: دارێکە دەخرێتە سەر شان‌و ملو دوو سەتل یا شتی وەها بەم سەرو ئەو سەرەکەیەوە هەڵدەگیرێت.
(ب) گیرە (مەکینەکاری). (٧) (ا) شان‌و ملی کراس‌و چاکەت.
(ب) ئەو بەشەی تەنوورەو کراسە کە دەکەوێتە سەر هەردوو سمت.
(٨) [Obs.]، پەلەیەك زەوی‌یە کە بە ڕۆژێك بکێڵرێ بە جووتێ گا.
(٩) [Scot.]، ماوەی نێوان دوو ووچانی جووتە گا.
(١٠) [Scot.]، بەشێکی ڕۆژی ئیشە؛ تاو.
***v.t.*** (١) نیلە کردن؛ نیلە کردنە مل. (٢) پێکەوە بەستن؛ لێکدان؛ جووت کردن.
(٣) مارەکردن؛ هێنان (ژنهێنان). (٤) [Rare]، بە دیل گرتن؛ کردن بە بەند.
***v.i.*** پێکەوە بەستران؛ بوون بە یەك؛ لێکدران.

**yoke-bone** (yōk′bōn), ***n.*** ئێسقانی گۆنە.

**yokefellow** (yōk′fel′ō), ***n.*** (١) هاودەم؛ ئاوەڵ؛ هاودەنگ؛ هاوڕێ؛ هاونیلە (مەجاز). (٢) هاوسەر؛ ژن؛ مێرد.

**yokel** (yō′k'l), ***n.*** لادێیی (لە ڕووی گاڵتەپێکردنەوە)؛ هیچ نەزان

**yolk** (yōk), ***n.*** (١) زەردێنەی هێلکە.
(٢) ڕۆنێکە لە بەرگنی مەڕ دەگیرێ.
**-yolky *(adj.)*.**

**yon** (yon), ***adj., adv. & pron.*** [Archaic],= **yonder.**

**yond** (yond), ***adv. & adj.*** [Archaic],= **yonder.**

**yonder** (yon′dēr), ***adj.*** ئەوێ؛ ئەوەی ئەوێ؛ ئەوانەی ئەوێ؛ ئەو؛ ئەوە: ***( Y~ stream is deeper than this one.; that road ~ )*** .
***adv.*** لەوێ؛ لەوێدا؛ لەو شوێنەدا.

**yoo-hoo** (yōō′hōō), ***interj.*** یووهوو: ووتەیەکە بۆ بانگ کردن، (وەك: " هۆ فلان کەس ! " ).

**yore** (yôr, yōr), ***n.*** ڕابووردوو؛ زوو؛ کۆن؛ کاتی کۆن: ***( days of ~ )*** .
***adv.*** [Obs.], لە کۆندا؛ لە ڕابووردوودا.

**Yorkshire pudding,** شیرینی‌یەکە لە هێلکەو ئاردو شیرو ڕۆناوی گۆشتی سوورەوەکراو دروست دەکرێت.

**Yorkshire terrier,** سەگێکی بچووکی تیسکنە لە ناوچەی " یۆرکشایەر " ی ئینگلتەرەوە هاتووە.

**you** (ū), ***pron.*** (١) تۆ. (٢) ئێوە. (٣) کەسێك؛ پیاو؛ مرۆڤ:
***( Y~ can't win them all.; Y~ can never tell.; It is much easier to cycle with the wind behind ~ .)***

**you-all,** ***pl. pron.*** [Southern U.S.], ئێوە.

**you'd** (ūd), **(1) you had. (2) you would.**

**you'll** (ūl), **(1) you will. (2) you shall.**

**young** (yuŋ), ***adj.*** (١) گەنج؛ لاو؛ منداڵ؛ جوان؛ هەرزەکار.
(٢) بەهێز؛ بەتین؛ گورج‌وگۆڵ. (٣) تازە (وەك حیزبێك یا بزووتنەوەیەکی تازە).
(٤) ساوا؛ تازە دامەزراو؛ تازە.
(٥) نەشارەزا؛ نەوکار؛ نەزان؛ کاڵ‌و کرچ؛ فەریك.
(٦) بچکەڵە؛ منداڵێکی بە ناوی باوکی‌یەوە ناونراو:
***( They say ~ Smith is ill.)***
***n.*** بەچکە؛ توورتکە؛ توورتەڵە؛ بەچکە بەگشتی: ***( a bear and her ~ )*** .
**the young,** لاوان؛ گەنجان؛ جوانان.
**with young,** سکپڕ؛ ئاوس.

**young blood,** (١) لاوان؛ گەنجان؛ خەڵکی گەنج.
(٢) گەنجی؛ بیروباوەڕو هێزو بازووی لاوان.

**youngish** (yuŋ′ish), ***adj.*** نەختێ گەنج.

**youngling** (yuŋ′liŋ), ***n.*** (١) گەنجێك؛ لاوێك؛ لاو؛ گەنج
(٢) بەچکە؛ نەمام. (٣) نەوکار؛ نەشارەزا؛ کەسێکی نەشارەزا.
***adj.*** گەنج.

**youngster** (yuŋ′stēr), ***n.*** (١) منداڵ. (٢) لاو؛ گەنجێك. (٣) بەچکە.
(٤) قوتابی پۆلی دووەمی ئەکادیمی هێزی دەریایی ئەمەریکی.

**Young Turk,** شۆڕشگێڕ؛ ڕادیکاڵی؛ پەرگر (ئەمە لەناوی حیزبی

" تورکیای تازە " یا " تورکیای لاو "ەوە وەرگیراوە کە لە سالی ١٩٠٨-١٩١٨ تورکیای دەبرد بەڕێوە).

**younker** (yuŋ′kēr), *n.* (١) لاو؛ پیاوێکی گەنج (٢) منداڵ.

**your** (yoor), *pron.* هی تۆ: *( Is this ~ book, wallet, etc.?)* .

**you're** (yoor, ūr), = you are.

**yours** (yoorz), *pron.* (١) هی تۆ *( Is this cup ~ ?)* .
(٢) ئەوەی تۆ *( Y~ was the first face I recognized.)* .

**yourself** (yoor-self′, yēr-self′), *pron.* ( *pl.* yourselves ),
(١) خۆت (دووپاتکردنەوە)؛ خۆت بەخۆت؛ خۆتی خۆت: *( You ~ went.)* .
(٢) خۆت: *( You'll hurt ~ .)* .
(٣) باری ئاسایی خۆت:
*( You haven't been ~ ever since your illness.)*

**yours truly,** (١) دلسۆزت: وتەیەکە نامەی پێ کۆتایی دەهێنرێت.
(٢) [Colloq.]، من؛ خۆم: *( This car belongs to ~ .)* .

**youth** (ūth), *n.* (١) گەنجێتی؛ گەنجی؛ لاوێتی؛ لاوی؛ هەرزەکاری؛ کوڕێنی؛ کچێنی. (٢) لاوان؛ گەنجان؛ جوانان: *( the ~ of a nation)* .
(٣) لاو؛ گەنج؛ هەرزەکار:
*( Several ~s showed up for the demonstration.)*

**youthful** (ūth′fəl), *adj.* (١) گەنج؛ هەرزە: *( ~ offenders)* .
(٢) گەنجانە؛ تایبەتی بە گەنج؛ وەك گەنج یا لاو:
*( a ~ appearance; ~ behavior)*
(٣) تازە؛ ساوا. (٤) چالاك؛ بەتین.

**-youthfully** *(adv.)*; **youthfulness** *(n.)*.

**youth hostel** = **hostel.**

**you've** (ūv; *unstressed* yoov, yəv), = **you have.**

**yowl** (youl), *v.i.* نالاندن؛ لووراندن؛ هاوارکردن
*n.* نالە؛ لوورە؛ هاوار

**yo-yo** (yō′yō′), *n.* یۆیۆ (١) یارییەکە بریتییە لە تالە بەنێك و بەکرەیەك سەرێکی تالە بەنەکە لە بەکرەکە پێچراوە و سەرەکەی تری لە پەنجەیەکەوە کە تالە بەنەکە ڕادەکێشی بۆ لای خۆت لەسەر بەکرەکە هەڵدەکرێ و کە بەریشی دەدەیتەوە دەکرێتەوە و هەروەها. (٢) [Slang]، کەسێکی ڕاڕا یا دوودڵ.
(٣) [Slang]، کەسێکی کەر یا بێ مێشك.

**yperite** (ē′pēr-it), *n.* = **mustard gas.**

**ytterbium** (i-tūr′bi-əm), *n.* ئیتربیۆم: توخمێکی کانزایی دەگمەنە (کیمیا)

**yttrium** (it′ri-əm), *n.* ئیتریەم: توخمێکی کانزایی دەگمەنە (کیمیا).

**yuan** (ū-än′), *n.* یوان: پارەی کۆنی چینییە.

**yucca** (yuk′ə), *n.* یەکە (١) ڕووەکێکی ئەمریکاییە لە توخمی شلێر گەڵاکەی وەك شیر تیژ و درێژە و گوڵەکەی سپی و هێشوودییە.
(٢) گوڵی ئەم ڕووەکە.

**yule** (ūl), *n.* جەژنی لەدایك بوونی عیسا؛ کریسمەس.

**yule log,** برەداری کریسمەس: برەدارێکی گەورەیە شەوی کریسمەس لە ئاگردانی ناوماڵدا دەسووتێنرا

**yule-tide** (ūl′tīd′), *n.* سەردەمی کریسمەس

**Yuman** (ū′mən), *n.* یوومان: زمانی خێڵی " یووما " و چەند خێڵێکی تری هیندی ئەمریکاییە کە لە ناوچەی ئەریزۆنا و خوارووی کالیفۆرنیا و مەکسیك دەژین.
*adj.* یوومایی: تایبەتی بە خێڵی " یووما " و زمان و کلتوورەکەیان.

**yummy** (yum′i), *adj.* [Colloq.]. زۆر خۆش (خواردەمەنی).

**yumyum** (yum′yum′), *interj.* [Colloq.]. زۆر خۆشە! (خواردەمەنی).

**yuppie, Yuppie, yuppy** (yŭp′i), *n.* [Colloq.], یەپی گەنجێکی بەهەلپەی شارنشینی خۆش گوزەران.

**yurt** (yŭrt), *n.* دەوارێکی چەرم یا لبادی خڕ و قووچکەداری مەنگۆلە کۆچەرەکانی سیبریایە

**ywis** (i-wis′), *adv.* [Obs.], = **iwis.**

# Z z

**Z, z** (zē; Brit. zed), ***n.*** (١) تیپی بیست‌و شەشەمی ئەلف‌وبێی ئینگلیزی‌یە. (٢) دەنگی ئەم تیپە: " زی " یا " زێد ". (٣) (ا) قاڵبی ئەم تیپە. (ب) ئەم تیپە بە چاپ کراوی یا هەڵکەنراوی. (٤) بیست‌و شەشەم؛ نیشانەی پلە یا ژمارەی بیست‌و شەشەمی ڕستەیەکە.

***adj.*** (١) تایبەتی بە تیپی Z . (٢) بیست‌و شەشەم.

**Z** (zē; Brit. zed), ***n.*** (١) شتێکە لە شێوەی Z دا. (٢) ژمارەی دوو هەزاری ڕۆمانی کۆنە.

***adj.*** وەك Z .

**z,** ژمارە یا بڕی نەزانراو (بیرکاری).

**zabaglione** (zäb´əl-yō′ni), ***n.*** زابلیۆنی خواردنەوەیەکی ئیتاڵی‌یە لە هێلکەو شەکرو ئاوی میوە یا شەرابی پێکەوە شلەقێنراو پێکدێت.

**zaffer, zaffre** (zaf′ēr), ***n.*** زافەر: تێکەڵاوێکە لە ئۆکسیدی کۆباڵت‌و سلیکا شووشەو فەخفووری پێ ڕەنگ دەکرێت بە شین.

**zamia** (zā′mi-ə), ***n.*** زامیا: درەختێکی قەد ئەستووری کورتی بێ لقی گەڵا باوەشێنی ناوچە گەرمەکانە لە کۆمەڵەی دارخورما.

**zamindar** (zə-mēn´där′), ***n.*** زەمیندار: (١) باجگری زەوی (لە هیندستانی کۆن). (٢) خاوەن زەوی؛ دەرەبەگ (بەتایبەتی کە باج بدات بە میری).

**zany** (zā′ni), ***n.*** (١) نوێنەری قۆشمەی شانۆگەری پێکەنیناوی کۆن. (٢) کەسێکی قۆشمەو لاساییکەرەوە. (٣) کەسێکی ساویلکە یا بێ مێشك.

***adj.*** (١) قۆشمە؛ پێکەنیناوی. (٢) سەیر؛ نابەجێ؛ بێ مانا. (٣) شێت؛ زۆر سەیر.

**zap** (zap), ***v.t.*** (١) لەپڕ کوشتن؛ پەلاماردان‌و کوشتن؛ لە مل دان. (٢) تەزووی ئەلەکتریك یا لێزەر لێدان. (٣) ڕاوەشاندن. (٤) لە مل دان (مەجان)؛ پەڕاندن.

***v.i.*** بە فڕکە ڕۆیشتن؛ بە توندی‌و زەبرەوە ڕۆیشتن.

***n.*** (١) گڤەف؛ فڕکە. (٢) پیامالین؛ هێرش.

**zareba, zareeba, zariba** (zə-rē′bə), ***n.*** (١) پەرژین یا تەیمانی ئۆردوگا (٢) ئۆردوگا یا دێی پەرژین کراو یا تەیمان کراو (بەتایبەتی لە سودان)

**zax** (zaks), ***n.*** ئامێرێکە لە تەشوێ دەکات.

**zeal** (zēl), ***n.*** هەستی بەجۆش؛ هەستی گەرم؛ پەرۆش؛ دڵ گەرمی: *( to show ~ for a cause, one's work, duty, etc.)*

**zealot** (zel′ət), ***n.*** (١) لایەنگری توندوتیژو کوێرانە؛ پەڕگر: *( a religious ~ )* (٢) [Z-]، ئەندامی کۆمەڵێکی ئاینی جوولەکەی پەڕگرە کە بە توندوتیژی بەرهەڵستی داگیرکەری ڕۆمانەکانیان دەکرد لە فەلەستین دا.

**zealotry** (zel′ət-ri), ***n.*** لایەنگری توندوتیژو کوێرانە؛ پەڕگری؛ هەست‌و دڵ گەرمی‌یەکی ئێجگار زۆر.

**zealous** (zel′əs), ***adj.*** بە پەرۆش؛ بە جۆش؛ هەست‌و دڵ گەرم؛ بە دڵ؛ خوێن گەرم: *( ~ to satisfy an employer; ~ efforts)* .

-zealously *(adv.)*; zealousness *(n.)*.

**zebec, zebeck** (zē′bek), ***n.*** = xebec.

**zebra** (zē′brə), ***n.*** کەرە کێوی: جۆرە کەرێکی کێوی میلی سپی‌و ڕەشدارە، واتە بازووە.

**zebra crossing,** [British], شوێنی پەڕینەوەی سەر شەقامی نیشانە کراو بە هێڵی سپی سپی.

**zebrass** (zē′bras´), ***n.*** جاشی نێرەکەری کێوی‌و ماکەری ماڵی.

**zebra finch,** فیسقەگولەیەکی ئوستراڵی بازووە.

**zebra fish,** جۆرە ماسی‌یەکی بازووە.

**zebrine** (zē′brīn, zē′brin), ***adj.*** لە کەرە کێوی دەچێ؛ تایبەتی بە کەرە کێوی.

**zebrula** (zē′broo-lə), ***n.*** *Also* zebrule, جاش یا جوانووی کەرە کێوی‌و ماین.

**zebu** (zē′bū), ***n.*** گای کۆپارەدار: جۆرە گایەکی زلی هیندستانی‌و ئەفەریقایی‌یە دووگێك بە پشت ماڵی‌یەوەیەتی.

**zecchino** (tsek-kē′nô), ***n.*** *Also* zechin = sequin # 1.

**zed** (zed), ***n.*** زێد: تیپی Z بەپێی وتنی ئینگلیزی. (ووشەی دووەمی دوای ئەمە ببینە)

**zedoary** (zed′ō-ēr′i), ***n.*** زەردەچەوە.

**zee** (zē), ***n.*** زی: تیپی Z بەپێی وتنی ئەمەریکی.

**zein** (zēn), ***n.*** پرۆتینێکە لە گەنمەشامی دەردەهێنرێ. (لە درووستکردنی پلاستیك‌و بۆیەو شتی وەهادا بەکاردێت).

**Zeitgeist** (tsīt′gīst´), ***n.*** [G], شێوەی بیرکردنەوەو بۆچوون‌و هەست‌و ڕەوڕشتی سەردەم یا چەرخێك.

**zemindar** (zi-mēn´där′), ***n.*** = zamindar.

**Zen Buddhism** (zen), *Also* Zen, زێن بوودیزم: ئاین یا فەلسەفەیەکی هیندی‌و یابانی‌و چینی‌یە بۆ گەیشتنە ڕۆشنبیری‌و ڕاستی لەڕێی بیرکردنەوەوە.

**zenana** (ze-nä′nə), ***n.*** ژنانە: بەشی ژنان لە خانوو یا ماڵی ڕۆژهەڵاتیدا.

**Zend-Avesta** (zen′də-ves′tə), ***n.*** = Avesta.

**zenith** (zē′nith), ***n.*** (١) تەوقەسەری ئاسمان؛ باڵاترین خاڵی ئاسمان (ئەستێرەناسی). (٢) تاف؛ ڕۆپە؛ تەوقەسەر؛ لووتکە؛ نووك؛ سەری سەر: *( He was at the ~ of his power and fame.)*

**zeolite** (zē′ə-līt´), ***n.*** زیۆلیت: جۆرێکە لە سلیکات لە بەردی ئاگرپڕژێندا.

**zephyr** (zef′ēr), ***n.*** (١) (ا) بای خۆرئاوا؛ شەماڵ؛ بای شەماڵ. (ب) شنە؛ شنە با. (٢) زەفیر: قوماشێکی تەنکە. (٣) شتێکی سووك، کەم، سەردەمی، هتد...

**Zephyrus** (zef′ēr-əs), ***n.*** خوای شەماڵ یا بای خۆرئاوا (ئەفسانەی یۆنانی).

**zeppelin** (zep′ə-lin, zep′lin), ***n.*** باڵۆنی زێپلین؛ باڵۆن.

**zero** (zêr′ō), ***n.*** (١) سفر. (٢) هیچ؛ سفر: *( His chances of success sank to ~ .)*

**zero in,** (١) نیشان (ی چەکی ئاگرین) چاکردن. (٢) ( ~ on ) مشت لێگرتنەوە؛ نیشان لێگرتنەوە؛ سەرنجی تەواو خستنە سەر.

**zero hour,** کاتی دیاریکراو: (١) کاتی دیاریکراو بۆ دەست بە هێرش کردن یا بە کارێکی تری سوپایی: *( ~ for the coup d'état was 3:00 a.m.)* (٢) کاتی دیاریکراو بۆ دەستپێکردنی کارێکی گرنگ.

**zest** (zest), ***n.*** (١) تام: مزری؛ تام خۆشی؛ شتی تام خۆشکەر؛ مەزە.
(٢) خۆشی؛ تام (مەجان): ***( Conversation adds ~ to a walk.)*** .
(٣) تاسەی ژین؛ جۆش؛ حەز؛ دڵ گەرمی؛ تین؛ خۆشی لێوەرگرتن:
***( to do something with ~ ; to enter into a plan with ~ )***
(٤) توێکڵە لیمۆو پرتەقاڵ (کە بۆ تام دەخرێتە شتەوە).
***v.t.*** خۆش کردن؛ تام خۆش کردن.
**-zestless *(adj.)*; zestlessly *(adv.)*.**
**zestful** (zest′fəl), ***adj.*** خۆش؛ مزر؛ بەتام؛ دڵ گەرم؛ بەتین؛ حەزکەر؛ بەجۆش
**-zestfully *(adv.)*; zestfulness *(n.)*.**
**zesty** (zest′i), ***adj.*** خۆش؛ بەتام؛ مزر؛ بەجۆش؛ بەتین؛ دڵ گەرم.
**zeugma** (zōōg′mə, zūg′mə), ***n.*** بەکارهێنانی کردارێك یا ناوەڵناوێك بۆ باس کردنی دوو ووتەی رستەیەك ئەگەرچی بەپێی رێزمان ئەبێ هەر باسی یەکێکیان بکات (رێزمان):
***( with weeping eyes and hearts; to kill a man and his dreams)***
**Zeus** (zōōs, zūs), ***n.*** زووس سەرگەورەی خواکانی یۆنانی‌یەکان (ئەفسانەی یۆنانی).
**zibeline** (zib′ə-līn′, zib′ə-lin), ***adj.*** زیبلین: تایبەتی بە سەمموورەو کەوڵەکەی.
***n.*** (١) کەوڵی سەمموورە. (٢) قوماشێکی نەرمی تووکاوی‌یە وەك فەروە.
**zibet, zibeth** (zib′it), ***n.*** = **civet.**
**ziggurat** (zig′oo-rat), ***n.*** زەقوورە: جۆرە بورجێکی قووچکەیی چەند نهۆمی ئاشووری‌و بابلی‌یەکانە.
**zigzag** (zig′zag′), ***n.*** (١) هێڵ یا نەخشەی پێچاوپێچ؛ رێباز یا شتی پێچاوپێچاوی. (٢) یەکێك لەم پێچانە؛ پێچ.
***adj.*** پێچاوپێچ؛ خواروخێچ؛ پێچاوی:
***( a ~ line, course, road, fence, trench, etc.)***
***adv.*** بە خواروخێچی؛ بە پێچاوپێچ؛ بە پێچو پەنا.
***v.t. & v.i.*** بە پێچاوپێچ رۆیشتن؛ پێچاوپێچ کردن.
**zikkurat, zikurat** (zik′oo-rat), ***n.*** = **ziggurat.**
**zillion** (zil′yən), ***n.*** [Colloq.], زیلیۆن: ژمارەیەکی بێ شومار؛ ژمارەیەکی ئێجگار زۆر.
**zinc** (ziŋk), ***n.*** چینکۆ؛ تووتیا؛ زینك.
***v.t.*** چینکۆ پۆش کردن؛ زینك لێدان.
**zincate** (ziŋk′āt), ***n.*** زینکات: خوێ‌یەکە لە یەکگرتنی زینك یا ئۆکسیدی زینك‌و ماددە تفتەکان پەیدا دەبێت.
**zincic** (ziŋk′ik), ***adj.*** چینکۆیی؛ زینکی.
**zincite** (ziŋk′īt), ***n.*** زینکایت: ئۆکسیدی زینکی سوور
**zincky, zinky** (ziŋk′i), ***adj.*** = **zincic.**
**zincography** (ziŋ-kog′rə-fi), ***n.*** زینکۆگراف: هەڵکەندنی تیپو وێنە، هتد... لەسەر تەبەقی چینکۆ بۆ چاپ کردنی.
**-zincographer *(n.)*; zincographic; zincographical *(adj.)*.**
**zinc ointment,** مەڵحەمی زینك: مەڵحەمێکە ئۆکسیدی زینکی تێدایە بۆ نەخۆشی پێست بەکاردێت.
**zincous** (ziŋk′əs), ***adj.*** **zincic.**
**zinc oxide,** ئۆکسیدی زینك؛ ژەنگی تووتیا؛ زینکی سپی.
**zinc white,** = **zinc oxide.**
**zing** (ziŋ), ***n.*** [Slang], (١) چالاکی؛ تین؛ گورج‌وگۆڵی؛ چوست‌و چالاکی؛ جۆش. (٢) ویزەوییز؛ گیزەگیز؛ زیکەزیك.
***v.i.*** ویزەوییز کردن؛ بە گیزەگیز رۆیشتن: ***( Bees ~ed by.)*** .
**zingara** (tsēŋ′gä-rä′), ***n.*** [It.], کچە قەرەج؛ ژنە قەرەج
**zingaro** (tsēŋ′gä-rô′), ***n.*** [It.], **gypsy.**
**zingy** (ziŋ′i), ***adj.*** [Slang], (١) خۆش‌و بە جۆش
***( a ~ play, opera, music, etc.)***
(٢) جوان‌و شۆخ‌و سەرنج راکێش؛ کەشخە: ***( She wore a new ~ dress.)***
**zinkenite, zinckenite** (ziŋ′kə-nīt′), ***n.*** زینکنیت: کانزایەکی خۆڵەمێشی‌یە (کیمیا)
**zinnia** (zin′i-ə, zin′yə), ***n.*** زینیا؛ گوڵە پایزە.
**Zion** (zī′ən), ***n.*** (١) گردی زایەن لە قودس
(٢) رەگەزی جوولەکە؛ جوولەکە بە گشتی؛ جوولەکان.
(٣) بەهەشت
**Zionism** (zī′ən-iz'm), ***n.*** زایۆنیزم؛ جوولەگەری.
**Zionist** (zī′ən-ist), ***n. & adj.*** زایۆنی؛ زایۆنیست؛ جوولەگەر.
**-zionistic *(adj.)*.**
**zip** (zip), ***n.*** (١) گیزە (وەك دەنگی گوللە)؛ گڤڤە؛ ویزە.
(٢) [Colloq.]، چالاکی؛ تین؛ جۆش؛ چوست‌و چالاکی.
***v.i.*** (١) گیزە کردن (وەك گوللە)؛ بە ویزە رۆیشتن؛ گڤڤە کردن.
(٢) [Colloq.]، بە پەلە چوون؛ خێرا چوون؛ بە فرکە چوون:
***( I'll just ~ to the store.)***
***v.t.*** [Colloq.], (١) خێرا بردن؛ بە پەلە بردن:
***( I'll ~ you to the airport in no time.)***
(٢) ( **up ~** ) خۆش کردن: ***( A little vinegar will ~ up the salad.)***
(٣) (ا) داخستن (بە زریزە وەك پانتۆڵ).
(ب) داخستن (دەم): ***( to ~ one's lips or mouth)*** .
**Zip Code, zip code** [ zone improvement plan], کلیلی-پۆستە؛ ژمارەی پۆستەی ناوچە: ژمارەیەکە پۆستەی ناوچەکە دیاری دەکات‌و بەشێکە لە ناونیشانی خەڵك‌و دەزگا لە ئەمەریکا (بۆ ئاسان کردنی پۆستە گەیاندن).
**zip fastener,** [British], **zipper.**
**zip gun,** دەمانچەی خۆماڵی.
**zipper** (zip′ēr), ***n.*** (١) جزمە یا کاڵۆشی زنجیردار.
(٢) زنجیری پانتۆڵ‌و بلووس، هتد...؛ زریزە؛ زیپ.
(هەروەها " **slide fastener** " وە " **zip fastener** ").
**zippy** (zip′i), ***adj.*** [Colloq.], چالاك؛ گورج‌وگۆڵ؛ خێرا؛ چوست‌و چالاك.
**zircon** (zũr′kon), ***n.*** زێرکۆن: سلیکاتی زێرکۆنیۆم: بەردێکی بلووری بەنرخە.
**zirconium** (zēr-kō′ni-əm), ***n.*** زێرکۆنیۆم: رەنگ زێری: توخمێکی کانزایی خۆڵەمێشی یا رەشە (کیمیا).
**zither** (zith′ēr), ***n. Also* zithern,** قانون: ئامێرێکی مۆسیقایە؛ سەنتوور.
-zitherist *(n.)*.
**zloty** (zlō′ti), ***n.*** زلۆتی: پارەی پۆڵەندی‌یە
**zo-** (zō), **zoo.**
**zoa** (zō′ə), ***n. plural of* zoon.**
**-zoa** (zō′ə), پاشگرێکە بەمانای: توخمە گیاندار: ***( protozoa)*** .
**zoanthropy** (zō-an′thrə-pi), ***n.*** شێتێتی‌یەکە کە شێتەکە خۆی بە گیانداری چوارپێ دەزانێ.
**zodiac** (zō′di-ak′), ***n.*** (١) بازنەی بورجەکان (ئەستێرەناسی)؛ بازنەی-کەلووەکان: بازنەیەکە کراوە بە دوانزە بەشەوە هەر یەکەی وێنەی کەلوویەکی تێدا نەخشە کێشراوە. (٢) وێنەی بازنەی بورجەکان (بە دوانزە بەشەکەیەوە)؛ نەخشەی بازنەی کەلووەکان. (٣) [Rare]، بازنە.
**zodiacal** (zō-dī′ə-k'l), ***adj.*** تایبەتی بە بازنەی بورجەکان (ئەستێرەناسی).
**zodiacal light,** ڕووناکی کەلوویی: ڕووناکی‌یەکە لە ناوچەی خۆرئاوادا پاش خۆرئاوا بوون دەبینرێ‌و لەناوچەی خۆرهەڵاتدا پێش خۆر هەڵاتن
**zoisite** (zois′īt), ***n.*** زۆیسیت: بەردێکی بەنرخی پەمەیی، خۆڵەمێشی، یا قاوەیی‌یە بریتی‌یە لە سلیکاتی کالسیۆم‌و ئەلەمنیۆمی ئاوی.
**zombi, zombie** (zom′bi), ***n.*** (١) خوای ئەژدیها (لای ئەوانەی

لەسەر ئاینی " ڤوودوو " دەپۆن لە پۆژئاوای ئەفەریقاو هایتیو هتد...).
(٢) (ا) هێزێکی لە سرووشت بەدەر مردوو زیندوو دەکاتەوە (لە ئاینو جادووگەری " ڤوودوو " دا). (ب) مردووی گیان بە بەردا کراو لەلایەن ئەم هێزەوە (کە بەپێی فەرمانی ئەم هێزەیش دەجوولێتەوە).
(٣) [Slang]، کەسێکی هەست مردووی حۆل بێ مێشکی گێژوویژ.
(٤) خواردنەوەیەکی مەستکەرە لە تێکەڵاوکردنی چەند خواردنەوەیەکی کحوولیو ئاوی میوە پێك دێت

**zonal** (zōn′'l), *adj.* (١) ناوچەیی؛ هەرێمی.
(٢) ناوچە ناوچە کراو؛ بەش کراو بە ناوچە ناوچە.

**zonary** (zōn′ə-ri), *adj.* = zonal.

**zonate** (zōn′āt), *adj. Also* **zonated,** ناوچە ناوچە کراو؛ هێڵ پێدا ڕاکێشراو بۆ بەش بەش کردنی.

**zonation** (zō-nā′shən), *n.* ناوچە ناوچە کران؛ بەش بەش کران بە هێڵی دیاریکەر

**zone** (zōn), *n.* (١) [Poetic] پشتێن؛ کەمەربەند
(٢) یەکێکە لە پێنج هەرێمەکەی ڕووی زەوی (بەگوێرەی ئاووهەوای هەرێمەکە ناونراوە: ***( torrid ~ ; temperate ~ ; frigid ~ )***.
(٣) ناوچە؛ هەرێم: ***( a canal ~ ; cotton ~ ; demilitarized ~ )***.
(٤) ناوچەیەکی شار (کە بۆ جۆرە بەکارهێنانێك تەرخان کراوە وەك بۆ: بازرگانی باخچە، ماڵ، هتد...).
(٥) ناوچەیەکی شارێکی گەورەی بەش کراو بە چەند ناوچەیەکەوە بۆ مەبەستی پۆستە.

***v.t.*** (١) بەش بەش کردن بە ناوچە ناوچەوە (بەتایبەتی شارێك کە هەر ناوچە یا گەڕەکێکی بۆ جۆرە بەکارهێنانێك تەرخان کرابێت وەك: بازرگانی، ماڵ، هتد...).
(٢) دەورەدان (بە پشتێن یا کەمەربەند). (٣) نیشانە کردن بە هێڵی جیاکەرەوە.

***v.i.*** بەش کران بە ناوچە ناوچەوە

**zonked** (zô′ngkt), *adj.* [Slang], *Also* **zonked out,** سەرخۆش (بە خواردنەوە یا بەنگ)؛ مەست؛ کەیل.

**zonule** (zōn′ūl), *n.* (١) هەرێم یا ناوچەی بچووك.
(٢) پشتێن یا کەمەربەندی بچووك

**zoo** (zōō), *n.* باخچەی گیانداران؛ باخچەی گیانەوەر. (هەروەها " **zoological garden** ").

**zoo-** (zō′ō, zō′ə), *Also* zo-, پێشگرێکە بەمانای: (ا) گیانەوەر؛ گیاندار ***( zoology)*** . (ب) گیانەوەرناسی: ***( zoogeography)*** .

**zoochemistry** (zō′ə-kem′is-tri), *n.* کیمیای گیانەوەری.

**zoogeographic** (zō′ə-jē′ə-graf′ik), *adj.* تایبەتی بە دابەشبوونی جوگرافی گیانەوەر.

**-zoogeographical** *(adj.)*; **zoogeographically** *(adv.)*.

**zoogeography** (zō′ə-ji-og′rə-fi), *n.* جوگرافیای گیانەوەری: لێکۆڵینەوەی دابەشبوونی گیانەوەر بەسەر ناوچەی جوگرافیدا.

**-zoogeographer** *(n.)*.

**zoogloea** (zō′ə-glē′ə), *n.* تۆپەڵە بەکتریایەکی جەلاتینیی‌یە پێکدێت بەهۆی ئاوسانی دیواری شانەیەکەوە کە ئاو زۆر هەڵدەمژێت.

**zoography** (zō-og′rə-fi), *n.* گیانەوەرناسی نیشانەهەڵدان: لقێکی گیانەوەرناسی‌یە بریتی‌یە لە نیشانەهەڵدانی گیانەوەرو لانەکەی.

**-zoographer** *(n.)*; **zoographic**; **zoographical** *(adj.)*.

**zooid** (zō′oid), *adj.* گیانەوەری؛ تایبەتی بە گیانەوەر؛ لە گیانەوەر دەچێ.

***n.*** (١) شانەیەك یا تەنێکی گیانەوەریی گەردبینی‌یە کە سەربەخۆی خۆی دەبزوێ وەك گیاندارێکی سەربەخۆ (وەك تۆوی تۆماو)
(٢) گیانەوەرێکی گەردبینی‌یە کە بەشێکە لە تۆپەڵە گیانەوەرێکی وەها

**-zooidal** *(adj.)*.

**zoolatry** (zō-ol′ə-tri), *n.* گیانەوەرپەرستی

**zoological** (zō′ə-loj′i-k'l), *adj. Also* zoologic, تایبەتی بە گیانەوەرزانی؛ گیانەوەری.

**-zoologically** *(adv.)*.

**zoological garden** = zoo.

**zoologist** (zō-ol′ə-jist), *n.* گیانەوەرزان؛ زانای گیانەوەر.

**zoology** (zō-ol′ə-ji), *n.* (١) گیانەوەرزانی؛ زانستی گیانەوەر.
(٢) گیانەوەری ناوچەیەك بەگشتی. (٣) زانستنامەیەکی گیانەوەرزانی

**zoom** (zōōm), *v.i.* (١) وییزەوییز کردن؛ ڤرە، گڤە، یا گززە کردن.
(٢) بە ووززە، گززە، یا ڤرە ڕۆیشتن: ***( The cars were ~ing by on the freeway.)***
(٣) بە پەلە ڕۆیشتن یا جووڵانەوە؛ خێرا هاتنو چوون.
(٤) خێرا فڕین، هەڵسان، یا بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان (فڕۆکە).
(٥) ( **~ in ; ~ out** ) نزیك خستنەوە یا دوور خستنەوەی دیمەن بە جووڵاندنی هاوێنەی کامێرا؛ جووڵاندنی هاوێنەی کامێرا بۆ دوورو نزیك خستنەوەی دیمەنێك.

***v.t.*** (١) خێرا فڕۆکە هەڵساندن بۆ ئاسمان.
(٢) (ا) دوورو نزیك خستنەوەی دیمەن بە جووڵاندنی هاوێنەی کامێرا
(ب) جووڵاندنی هاوێنەی کامێرا لەپڕ بۆ ئەم مەبەستە.

***n.*** (١) ووزەووز؛ ڤرە؛ گڤە؛ گززە. (٢) لەپڕ هەڵسانی فڕۆکە.

**zoometry** (zō-om′ə-tri), *n.* ئەندازەگیری گیانەوەر؛ ئەندازە گرتنو بەراووردکردنی گیانەوەرو ئەندامەکانی.

**-zoometric**; **zoometrical** *(adj.)*; **zoometrically** *(adv.)*.

**zoomorphic** (zō′ə-môr′fik), *adj.* گیانەوەری؛ شێوەی لە گیانەوەر چوو: ***( a ~ deity)*** .

**zoomorphism** (zō′ə-môr′fiz'm), *n.* (١) بە گیانەوەر پیشاندانی خوا؛ گیانی گیانەوەر کردن بە بەر خودادا؛ تایبەخۆی گیانەوەر نان بە خواوە (ووشەی " **anthropomorphism** ").
(٢) شێوەی گیانەوەر بەکارهێنان لە هونەردا.

**-zoon** (zō′on), پاشگرێکە بەمانای: گیانەوەر؛ شانە یا گیانەوەری گەردبینی سەربەخۆ: ***( spermatozoon)*** .

**zooparasite** (zō′ə-par′ə-sīt′), *n.* گیانەوەری مشەخۆر.

**-zooparasitic** *(adj.)*.

**zoophagous** (zō-of′ə-gəs), *adj.* گیانەوەرخۆر؛ گۆشتخۆر.

**zoophile** (zō-of′ə-li), *n.* گیانەوەر دۆست (بەتایبەتی یەکێك کە دژی توێکاری گیانداری زیندوو بێ لە تاقیگەدا).

**zoophilous** (zō-of′ə-ləs), *adj.* (١) گیانەوەر دۆست؛ گیانەوەرخواز.
(٢) بە گیانەوەر چات کراو (ڕووەك).

**zoophobia** (zō′ə-fō′bi-ə), *n.* ترسی گیانەوەر؛ لە گیانەوەر ترسان.

**zoophyte** (zō′ə-fīt′), *n.* گیانەوەری ڕووەکی: گیانەوەری لە ڕووەك چوو لە شێوەو تایبەخۆدا (وەك شیلانو ئیسفەنج).

**-zoophytical** *(adj.)*.

**zooplasty** (zō′ə-plas′ti), *n.* پەیوەست کردنی شانەی گیانەوەر لە لەشی مرۆڤ.

**-zooplastic** *(adj.)*.

**zoosperm** (zō′ə-spūrm′), *n.* = spermatozoon.

**zoospore** (zō′ə-spôr′, zō′ə-spōr′), *n.* تەنی یەك خانەیی ڕووەکی بزۆك (وەك هەندێ قەوزە).

**-zooporic**; **zoosporous** *(adj.)*.

**zootechnician** (zō′ə-tek-nish′ən), *n.* گیانەوەر پەروەردەکەر.

**zootechnics** (zō′ə-tek′niks), *n.* = zootechny.

**zootechny** (zō′ə-tek′ni), *n.* گیانەوەر پەروەردەکردن؛ پەروەردە- کردنو زاوزێ پێ کردنو وەچە چاك کردنی گیانەوەر.

**-zootechnical** *(adj.)*.

**zootomy** (zō-ot′ə-mi), *n.* (١) توێکاری گیانەوەر.
(٢) توێکاری بەراوورد.

**-zootomic**; **zootomical** *(adj.)*.

**zoot suit,** دەستە جلێکی پیاوانەی کۆن باوە لە پانتۆڵێکی دەڵبی دەرەلنگ

تەسك و چاكەتێكی درێژو یەخە پان و قەنەواچە ئەستوور پێكدێت.
**zoril, zorille** (zôr′il), *n. Also* zorila, گیانەوەرێكی شیرەمەری ئەفەریقی‌یە لە توخمی مشكی خورما.
**Zoroastrian** (zō′rō-as′tri-ən), *adj.* زەردەشتی؛ تایبەتی بە زەردەشت و ئاینەكەی
*n.* زەردەشتی؛ كەسێكی زەردەشتی.
**Zoroastrianism** (zō′rō-as′tri-ən-iz′m), *n.* زەردەشتی؛ ئاینی زەردەشتی (كە دەڵێت: لە جیهاندا دوو خوا یا هێز هەیە یەكێكیان هی باش یا ڕووناكی و ئەوی تریشیان هی خراپ یا تاریكی‌یە و ئەم دوو هێزە هەمیشە لە ناكۆكیدان؛ بەڵام لە ئەنجامدا هێزی ڕووناكی سەردەكەوێت).
**zoster** (zos′tēr), *n.* (١) كەمەر؛ پشتێن. (٢) herpes zoster.
**zounds** (zoundz), *interj.* [Archaic], جوێنێكە توڕەیی، بێزاری، یا سەرسامی دەردەبڕێ.
**zucchetto** (tsōō-ket′ō), *n.* كڵاوی قەشە كاسۆلیك و سەرەك قەشەو پاپا
**zucchini** (zōō-kē′ni), *n.* كوولەكە باریكەی سەوز؛ كوولەكەی چێشت.
**zwitterion** (tzvit′ēr-ī′ən), *n. Also* zwitter ion, ئایۆنی جووتە یا هاوبەش ئایۆنی گەرم و سارد یا بەهێزو بێ هێز پێكەوە (كیمیای فیزیایی).
**zygapophysis** (zig′ə-pof′ə-sis, zī′gə-pof′ə-sis), *n.* جووت چوكڵە یا زیادە ئێسقانێكە كە دوو بڕبڕە لێك دەدات.
**zygo-** (zī′gō, zig′ə), *Also* zyg-, پێشگرێكە بەمانای: (١) جووت؛ دوو *(zygodactyl)*. (٢) جووت بوون؛ یەكگرتن: *(zygospore)*.
**zygodactyl** (zī′gə-dak′til, zig′ə-dak′til), *adj.* جووت چنگ؛ دووچنگە. دوو چنگی بەرەو پێشەوەیەو دووانیشی بەرەو دواوە (وەك هەندێ باڵندە).
*n.* باڵندەی دووچنگە. باڵندەیەكە دوو چنگی لە دواوەیەو دوو چنگیشی لە پێشەوە (وەك تووتی).
**zygoma** (zī-gō′mə, zi-gō′mə), *n.* (١) zygomatic bone. (٢) zygomatic arch. (٣) zygomatic process.
**zygomatic** (zī′gə-mat′ik, zig′ə-mat′ik), *adj.* كوڵمی؛ گۆنەیی؛ تایبەتی بە ئێسقانی گۆنە.
**zygomatic arch,** كەوانەی كوڵم یا گۆنە
**zygomatic bone,** ئێسقانی كوڵم (هەروەها " cheek-bone ").
**zygomatic process,** چوكڵە یا زیادە ئێسقانی كوڵم (كە كەوانەی كوڵم پێك دێنن).
**zygomorphic** (zī′gə-môr′fik, zig′ə-môr′fik), *adj. Also*- **zygomorphous,** دووقلیقانە (ڕووەكناسی، گیانەوەرناسی)؛ دوانە؛ دوو بەشی پەیوەست.
-**zygomorphism** *(n.)*.
**zygosis** (zī-gō′sis, zi-gō′sis), *n.* جووت بوونی دوو " گەمیت "، واتە خانەی زاوزێ.
**zygospore** (zī′gə-spôr′, zig′ə-spōr′), *n.* تەنێكی پێكهاتوو لە جووت بوونی دوو " گەمیت "، واتە خانەی زاوزێی هاوڕەگەز.
**zygote** (zī′gōt, zig′ōt), *n.* زایگۆت: خانەی پێكهاتوو لە جووت بوونی دوو " گەمیت "، واتە خانەی زاوزێ.
-**zygotic** *(adj.)*.
**zymase** (zī′mās), *n.* زایمێز هەوێنێكە شەكر دەگۆڕێت بۆ ئەلكهوول و دووەم ئۆكسیدی كاربۆن، واتە دەبێتە هۆی ترشان.
**-zyme** (zīm), پاشگرێكە بەمانای: هەوێن؛ ئەنزیم.
**zymo-** (zī′mō, zī′mə), *Also* zym-, پێشگرێكە بەمانای: ترشان: *(zymology)*
**zymogen** (zī′mə-jən), *n. Also* zymogene, زایمۆجین: هەوێن پەیداكەر؛ ترش پەیداكەر.
**zymogenic** (zī′mə-jen′ik), *adj. Also* zymogenous, (١)- تایبەتی بە " زایمۆجین " (ووشەی پێشوو ببینە). (٢) ترشێنەر. (٣) هەوێن پەیداكەر؛ ترش پەیداكەر.
**zymology** (zī-mol′ə-ji), *n.* هەوێنزانی؛ زانیاری هەوێنەكان؛ زانیاری هەوێن و ترشان.
-**zymologic; zymological** *(adj.)*; **zymologist** *(n.)*.
**zymolysis** (zī-mol′ə-sis), *n.* ترشان.
-**zymolytic** *(adj.)*.
**zymometer** (zī-mom′ə-tēr), *n.* زایمۆمەتر: ترشان پێو؛ ئامێری ترشان پیشاندەر.
**zymoplastic** (zī-mō′plas′tik), *adj.* هەوێن پەیداكەر؛ ترش پەیداكەر
**zymoscope** (zī-mō′skōp′), *n.* زایمۆسكۆپ: هێزی هەوێن پێو؛ ئامێرێكە هێزی ترشاندنی هەوێن دەپێوێت.
**zymosis** (zī-mō′sis), *n.* (١) ترشان. (٢) نەخۆشی تووش بوون. (٣) [Rare]، درم؛ نەخۆشی پەڕۆك.
**zymotic** (zī-mot′ik), *adj.* (١) تایبەتی بە ترشان. (٢) پەڕۆك؛ تایبەتی بە نەخۆشی پەڕۆك: *(a ~ disease)*.
**zymurgy** (zī′mēr-ji), *n.* كیمیای ترشان: لقێكە لە كیمیا لە ترشان دەكۆڵێتەوە (بەتایبەتی دەربارەی شەراب و بیرە گرتنەوە)؛ ترشانزانی.

